**هەنگاوێک:**

لە ڕێنووسی کوردیـدا، جووتواو بۆتە نیشانەی یەک واچ (فۆنیم)! لە سەرواژەکاندا، ئەو جووتەمان هێندێک لێک نێزیکتر کردووتەوە و بەم شێوە /وو/ نووسیومانن.

بەو هیوایـە هـەنـگاوێک بێ بـەرەو چارەسـەرێکی یـەکجارەکی.

# فەرهەنگی زانستگای کوردستان

## چواربەرگی ـ ١

**بە سەرپەرستی ماجد مەردۆخ ڕۆحانی**

**نڤیسیاران**

مەهدی سەنەندەجی * مەحیەددین کەریمیان * یەدوڵڵا پەشابادی

موحەممەدژیان ئەمینی * کامران جەوهەری

**پیتچنی و گەڵالەی لاپەڕەکان**: مەحیەددین کەریمیان

سەبری مەحموودیان * سەیران دهقان

**پێداچوونەوەی گوڵ و گیا**: ئیرەج مورادی

**پێداچوونەوەی گیانەوەران**: کەماڵ ڕەحمانی

**پشتیوانی نەرمامێری**: هادی ئەسغەری * هیوا ڕوستەمیزادە

**ناوی باقی هاوکارەکان لە لاپەڕەی بیستوشەش**

**پەخشانگای زانستگای کوردستان**

١٣٩٨

شماره کتاب‌شناسی ملی: ۵۹۱۰۲۳۱
موضوع: کردی ـ واژه‌نامه‌ها
عنوان کامل کتاب: **فرهنگ کردی دانشگاه کردستان**
عنوان کتاب به زبان اصلی: **فەرهەنگی زانستگای کوردستان**
مولف یا مولفان: محمد ماجد مردوخ روحانی
شماره ثبت: ۱۴۸۴۷۱۳

تاریخ ثبت درخواست: ۱۳۹۸/۰۷/۲۴
تعداد صفحه: ۸۱۶ قطع: وزیری
ناشر: دانشگاه کردستان
شابک: جلد اول: ۵-۱۹-۲-۶۷۰۲-۶۲۲-۹۷۸
دوره: ۸-۱۸-۲-۶۷۰۲-۶۲۲-۹۷۸
تاریخ صدور مجوز: ۱۳۹۵/۱۲/۱۷

**زانستگای کوردستان**

فەرهەنگی زانستگای کوردستان
بە سەرپەرستی ماجد مەردۆخ ڕۆحانی
بەرگی یەکەم: ئ ـ ج
ڕووبەرگ: حەمیدڕەزا زەڕڕی
لیتۆگرافی: نیک پەردازان
سەرپەرستی چاپ: کوورش عەنبەری
چاپ: تایفە
جزوبەندی: گوڵستان

چاپی یەکەم: بەهاری ۱۳۹۷ (۲۰۱۸)
چاپی دووهەم: زستانی ۱۳۹۸ (۲۰۲۰)



www.uok.ac.ir/dictionary

بڵاوکراوەی زانستگای کوردستان

سنە - زانستگای کوردستان
087-33624008
press@uok.ac.ir
uok.ac.ir/press
@uokpress

## سپاس و پێزانین

بۆ چاپی دووهەمی ئەم فەرهەنگە، ئەم دۆستانەمان هەرکام سەری کارێکیان گرت و ئۆدەداری زەحمەتێک بوون:
د. ڕەحمەت سادقی، د. کەیوومەرس کەرەمی، د. شەمسەدین ئەحمەدی، دادە سەیران کاردووسیان و کاکە کوورش عەنبەری.

**سپاسیان و داوای سەربەرزی بۆیان**

**دێـرەن، بـا ئـێـمـەیچ نـەی گـوزەرەوە**
**جامێ وە دەس نێین دەس وە سـەرەوە**
**«مەولەوی»**

کوردی لای ئێمه ئێژن: «خێڵ بار ئەکەن و پیرەژن کەپر ئەوەسێ!»

ڕاستت دەوێ، باس و بەسەرهاتی ئەو پیرێژنە، لە زۆر بارەوە لە ئێمەی کـورد قـەوماوە؛ یەکیان: بواری زمان و زمانەوانی.

ئەگەر چاوێک لە کتێبخانەی خەڵـکانی دراوسـێ و دەوروپشـتمان بکـەین، دەبیـنین چەند دارا و دەوڵەمەندن و تا کوێ ڕۆیشتوون و بە کوێ گەیشتوون.

بۆ نموونە، بواری فەرهەنگنووسین: باسی ئینگلیزی و عەرەبی لەگەڵ ئێمەدا، دیارە هـەر بۆ کردن نابێ! با چاوێ لە فارسی بکەین: هەر لەم سی ـ چل ساڵەدا، بە دەیان فەرهـەنگ و فەرهەنگی بەرفراوان و زانستنامەی گەورە و بچووکی لە هەموو بابەتێک دەرهاتووە؛ یەک لە یەک جوانتر؛ یەک لە یەک ڕازاوەتر. هێنـدێکیان بووجـەی تایبـەتیان بـۆ تـەرخان کـراوە و هێندێک تەنانەت وارخان و عەمارەتی گەورەیان بۆ کراوەتەوە و بە دەیان پسپۆڕی زمانـەوان و وێژەوان و مێژووزان و چی و چیوان و چی و چیزانی تر لە سەری کار دەکەن.

ئەمجار بەشی ئێمە؟

ئەوە بۆ سی ساڵان دەچێ *هەنبانەبۆرینە* لە چاپ دەرچووە. لەم ساڵانە چەنـد جـاران، تەنانەت بە دزیش! چاپ کراوەتەوە، خـوا ئـەیزانێ؛ بـەڵام بـێ زیـاد و کـەم! تەنانـەت ڕێ نەدراوە هەڵە چاپییەکانیشی لێ بسڕینەوە!

ـ شتی وا چۆن دەبێ؟

ـ چۆن وا نەبێ؟ وەژاردنەوەی کتێبان خەرج لە سـەر دەسـتی خـاوەنی (!) دادەنـێ و خاوەنی *هەنبانە*ش پەخشانگایەکە[1] خۆیشی تەواو بۆ ناگەڕێ؛ لە کوێ بێنێ خێرات بکا و بە خێری خۆی، لەسەرڕا ئەو هەزار و چەند لاپەڕەیە تێکبداتەوە و دیسان تێکیبخاتەوە؟ خۆ

---

١ . «پەخشانگا» بۆ «مطبعە»ی عەرەبی و «انتشارات» فارسی.

دامودەزگایەکی پشتیوانیشمان نییە چاوی لە بەهرە و داهات نەبێ و وەک بۆ زمانەکانی تر دەکرێ، بۆ زمانی کوردیشی بکا و پشتی کاری وا بگرێ. بەو پێیە، ئەوەش کە سی‌وچەند ساڵی پێش دەستی دا، هەلێک بوو، هەڵکەوت. مەسەل دەڵێ: «هۆیە و هەر ئەمڕۆیە» چۆن هات؟ هەر وایشە چوو ... هەیهوو تا خولێکی تر و دەرفەتێکی تر!

***

پاش دە ساڵان بە ڕۆژهەلات و باشووردا گەڕان و لە هەموو شار و باژێڕێک سەردان و هەموو دەرک و دەروازەیەک کوتان، سەرەنجام دەرگای زانستگای کوردستانم بە ڕوودا کرایەوە؛ کە هەر وەک لە پێشەکی فەرهەنگە فارسی ـ کوردییەکەدا باسم کرد، بۆ من و ئەوی بە ئارەزووی بووم، دەرگانەی ڕەحمەت بوو. دیسانەوە خۆشییەک کەوتە دڵم کە لەو شوێنە زانستییە، بە یارمەتی مامۆستایانی بەپەرۆش بۆ بارودۆخمان و خوێندکارانی بەئەمەگ و ئامادەی قۆڵ هەڵماڵین و لە خۆ نەوین، بەشێک بە ناوی «فەرهەنگ‌نووسی» دامەزرێنین و بە پێی توانا، لەو بوارەدا هەنگاو هەڵبێنین.

بە بۆچوونی من، بۆ ئێمە (کوردی ڕۆژهەلات) کە تا لە بیرمان بێ، دەرفەتی کوردی خوێندنمان نەبووە و هەر فارسییان پێ خوێندووین و خواناخوا، کەم تا زۆر، فێری ئەو زمانە بووین و پێ ڕاهاتووین و ئێستا تامەزرۆی خوێندنەوە و نووسین بە زمانی خۆمانین، لە هەموو کتێبێ گرنگتر، فەرهەنگێکی فارسی-کوردی بە شێوازێکی تایبەتە؛ کە بە ناونیشانی واژە فارسییەکە، وشە و دەستەواژەی کوردی تێدا بدۆزینەوە و گفت و گوتاری خۆی پێ پوخت‌وپاراو بکەین و برازێنینەوە. بەو بۆنەوە دانانی فەرهەنگێکی «فارسی-کُردی»م پێشنیار کرد کە خوا هەڵناگرێ، زۆربەی زانستگاییەکان بە ڕووی خۆشەوە لێیان وەرگرتم. لەو لاشەوە خێلێک زانای دلسۆز و خوێندکاری خاوەن هەست، لە زانستگا و دەرەوە، دەستیان گرتم و ئاکامی کار، ئەو سێ فەرهەنگە بوون (سێ‌بەرگی و یەک‌بەرگی و چکۆلە) کە هاتنە بازاڕی کتێب و وەک دیتمان و دەبینین، جێی خۆیان کردۆتەوە و خاوەنی خۆیان دۆزیوەتەوە.

ئەمجار زانستگای کوردستانیش، بە دوورنواڕی و دڵفراوانییەوە، لێی وەرگرتین کە بۆ هەر چاپێکی نوێ، ڕێمان هەبێ وەردی دەینەوە و تازەی بکەینەوە. وا بوو کە چاپی دووهەمی سێ‌بەرگی، هێندێک دەوڵەمەندتر بۆوە و نزیک بە هەژدەهەزار وشە و دەستەواژەی کوردی لێ زیاد کرا. لە خوا بەزیاد بێ.[۲]

۲. دیارە کەش‌وهەوای زانستگایش هەموو وەرزێ بەهار نەبووە و جاروباریش ڕچاندوویە! بەلام وەک نالی دەفەرموێ: «بۆ عاشقی بێچارە زوو ئەم ئاوە ڕژاوە».

## باسی ئەم فەرهەنگە

هاوکات کە خەریکی ئەو کارە بووین ـ وەکوو ئاواتێک ـ لە فەرهەنگێکی کوردی، هەر لە سەر ئەو ڕێباز و شێوازە، بیرم دەکردەوە و لەگەڵ هاوکاران لێکمان دەداوە: لە کوێوە دەستپێبکەین و چۆناوچۆن دەستبەکار بین؟

هاتەوە بیرم، ئەو دەم کە لە بەردەستی مامۆستا هەژار، سەرمان بە *هەنبانەبۆرینە*وە قاڵ بوو، هەموو ئەو فەرهەنگە کوردییانەی تا ئەو سەردەمە لە چاپ دەرچووبوون، لە دەورمان بوون. ئەگەرچی بیچم و چوارچۆی کارەکەمان بە شێوەیەکی تر و کارمان لەسەر داب و دەستوورێکی تر بوو؛ بەڵام لەو کتێبانە و بەتایبەت لە *فەرهەنگی خاڵ*، زۆرمان بەهرە برد و تەنانەت وشە بە وشەیمان پشکنی. باشە ئێستا بۆ لەگەڵ *هەنبانە*دا عەینی شت نەکەین؟ بەتایبەت کە زۆر ڕستە و دەستەواژەی جوان و ڕەسەنی تێدان کە مامۆستا هەژاری بلیمەت دایناوە و بەڕاستی حەیفە لێیان بێبەش بین. بێتەوە بیرمان، مامۆستا هەژار بۆخۆی دەفەرموێ: «بەهومێدم ئەو کەسانەی لە دواڕۆژدا فەرهەنگی کوردی دەنووسن، لەم کارەی منیش، کەموبێشێک سوود و بەهرە هەڵگرێنن.»

دیارە ئەمە یەکەم جار نییە دەستی یارمەتی بەرەو ئەو کتێبە دادەکێشین. پازدە ساڵی پێش، کە بۆ کاری فەرهەنگە فارسی ـ کوردییەکە، چەند فەرهەنگی گەورە و بچووکی کوردیمان کردە فیش، یەکەمیان *هەنبانەبۆرینە* بوو. جا کە تۆ فەرهەنگێ بێنی و وشە بە وشەی بکەیە فیش و بان و خواری لێک بدەیەوە و ورد و درشتی لێک بکەیەوە، ئەمجار هەموو خاڵی بەقەوەت و لاوازی، زەق خۆ دەردەخەن و ئەوی شیاوی پێ زانین بێ، پێی دەزانی.

**چەند خاڵێک**: مامۆستا هەژار لە پێشەکییەکەیدا ئاماژە بە زمانی عەرەبی و دەوڵەمەندیی ئەو زمانە دەکا و «وشتر» و «شێر» بەنموونە دێنێتەوە کە لە عەرەبیدا هاوواتای لە سەتیشی تێپەڕاندووە. ئێمە کە وەکوو کارێک، کەوتینە کۆکردنەوە و لە پەنا یەکتر دانانی وشە هاوواتاکان، تەمەشا دەکەین لەو بارەوە شتێکمان لە عەرەبی کەم نییە و کەم نین ناوی وا کە هاومانای بە دە و بیست و سی و پەنجاشەوە ناوەستێ! تەنیا ئەوەیە کە وەک زۆر شتی ترمان، پەرژ و بڵاون و لە شوێنیک کۆوە نەکراون. تەنانەت لە *هەنبانە*شدا زۆر وشەی وا هەن کە وەک هاوواتا هاتوون، بەڵام بۆخۆیان نەبوونەتە لێما (سەرواژە) و لە هیچ کوێش زیاتر لە سێ و ئەوپەڕی، چوار هاوواتا یەکیان نەگرتۆتەوە.

لە *هەنبانە*دا شرۆڤەی زۆرێک لە لێماکان وەکوو ناوە؛ ئەگەرچی وشەکە زەق دیارە کە ئاوەڵناو یا ئاوەڵکارە؛ یان لە بارێکی تری ڕێزمانیدایە. تەنانەت جاروباریش، لەبەر ڕاژەی

ناتەواو و نەبوونی هاوواتا و ڕستەیەک بە نموونە، باری ڕێزمانی لێماکـە دەرناکـەوێ، ئـاخۆ ناوە یان ئاوەڵناو؟ چاوگە یا ناوی چاوگ؟ یان ... دەقێکی پێومانیش نییە کـە پشـتی پـێ ببەستی و لە ڕاستیدا سەرگەردان دەبی.

بەڕاستی ئەگەر شتەکە ورد بکەینەوە، هەر لە هەڵەی چاپییەوە تا ئیملایی و ڕیزبەنـدی و دانانی لێما و شرۆڤە و شوێن و هاوواتای سەرواژە و ... لە *هەنبانە*دا گیروگرفـت کـەم نـین و وەک لە سەرەتاوە عەرزم کردن، دەبوو ئەم سی ساڵە، زۆری لەسەر کار کرابا، کە نەکراوە.[٣]

لە لایەکی ترەوە: ئـەوە چەنـد ساڵـە بـە هـەموو گیـان و توانمانـەوە خـەریکین وشـە و دەسـتەواژە و زاراوەی کـوردی کـۆ دەکەینـەوە، هاوواتـا و بەرامبـەریان بـۆ دەدۆزینـەوە، ناسنامەیان بۆ دادەنین، جێیان دەسنیشان دەکەین و... لە سەر ئەو داب و دەستوورە، چەند فەرهەنگمان لە چەند قەبارەدا بەرهەم هێناوە و لە هەموو گرنگ‌تر، ئـەزموونێکی باشمـان لـە کاری فەرهەنگ‌نووسیندا دەس‌کەوتووە؛ ئێستا و بۆ ئەم کارە، بۆچی بەهرەی لێ نەبەین؟

سەرەنجام هاتینە سەر ئەو بڕیارە کە ماڵی نوێمان لە سەر بنەڕەتی «*فرهنگ فارسـی ـ کُردی دانشـگاه کُردسـتان*» بکەینـەوە؛ بـەڵام لـە مـاک و خەزینـەی پـڕ لـە نەختینـەی «*هەنبانەبۆرینە*» ئەوپەڕی کەڵک و بەهرە وەرگرین؛ بەم شێوە:

پێش هەموو شتێ هەڵە چاپییەکانیمان ڕاست کردەوە؛ کـە لـەو سـاڵانەدا بـەرچاومان کەوتبوون. ئیمجا لێ کەوتین، هەموو ناوە تایبەتییـەکان (اعلام)مـان لـێ دەرێنـا؛ کـە بـۆ فەرهەنگی وشە و دەستەواژە نابن؛ وەک: ناوی ئەو گوندانە بەعسی کاولی کـردوون، نـاوی شار و شارۆچکە و هەروەها کەسـایەتییەکان و ... پاشـان وشـەی وامـان لابـرد کـە لێمـا (مدخل) نـین. وەک: «بچـۆ» (فـەرمان بـۆ ڕۆیشـتن) کـە سـەرفی فیعلـی، لـە چـاوگی «چوون»ە. یان «دەست خستن» کە چاوگێکی سەربەخۆ نییە و وەک لێکدراوێکی فیعلی، دەبێتە ژێرلێمای «دەست» و دەبێ بچێتە جێ‌وشوێنی خۆی و ...

ئەم گەردیلە، یان فارس گوتەنی: «خانەتەکانی»یە، دەوری یەک لە سێی کتێبەکـەی سڕییەوە. لێرەدا بڕیارمان دا پێش ئەوەی دەسـت بـۆ قـەبارەی کارەکـە بـەرین و وشـەی

---

٣. بێ‌شک مەبەست بە هـیچ شـێوەیەک بـێ‌قـەدر کـردنی ئـەو یادگـارە بایەخـدارەی مامۆسـتای هەتاهەتاییمان نییە و هەموو باش دەزانین کە *هەنبانەبۆرینـە*، بەتایبـەت لـە سـەردەمی خۆیـدا، چ خزمەتێکی گەورە و بۆ هەمیشە، چ خەزێنەیەکی گرانباییە.

تازەی «تیٚئاخنین»[٤] ئەوەی هەمانە ڕێکوپێک و پوختوپاراو بکەینەوە و بیهێنینە سەر داب و دەستووری فەرهەنگە فارسی ـ کوردییەکە. ئەم کاری بە گوتن هاسان و بە کردن گرانە، بۆخۆی چەند قۆناغی جیاوازی گرتەوە کە بەکورتی، بریتین لە:

١. **ڕێنووس**: دەقی کتێبەکەمان هێنایە سەر ڕێنووسی یەکگرتووی ئەوڕۆ؛ ئەگەرچی تا ئێستا لەم بارەوە نەبووینەتە خاوەن دەستوورێکی وا کە ئارخەیان پشتی پێ ببەستین؛ بەڵام هەر دیسان لەچاو سی ساڵی پێش، بەرەو پێش ڕۆیشتووین و لەحاند ڕێنووسی زۆر زەمانان، شوکور باشین. بۆ نموونە: هەموو ئەو پیتانە کە لە زمانی کوردیی یەکگرتوودا یان هەر نایەنە سەرزار، وەک: /ث/ و /ذ/ و /ض/ و /ظ/، یا ئەگەریش دەگوترێن، «واچ»ێکی سەربەخۆ (فونیم)[٥] نین وەک: /ص/ و /ط/، لابران و سێ پیتی /ت/ و /ز/ و /س/ لە جێگایان دانیشتن. هەروەها دەنگی واوی کێشدار، کە لە هەنبانەدا بە نیشانەی /ۆ/ یان زۆر جار /و/ا نووسراوە، بوو بە /وو/. ئەگەرچی لەم بارەوە تێبینیمان هەیە و لە شوێنی خۆی ئاماژەی پێ دەکەین؛ بەڵام یەکڕیزیمان نەشێواند؛ چونکوو لە باسی زمان و بەتایبەت ڕێنووسدا، بڕیارێکی هەموانی، ئەگەر هەڵەیش بێ، دیسان باشترە لەوەی هەرکەسێ بۆخۆی بڕیارێ بدا و کەس لە کەس تێنەگا.

---

٤. سی ساڵی پێش، لە ئێران، کەمپیوتەر نەهاتبووە نێو کاری کتێبەوە و هەموو کارێکی بە دەست دەکرا و دەبوو دێڕبەدێڕی تایپکراوە، لە سەر لاپەڕەی قالب (لەیئۆت) دالکێ. بۆ *هەنبانەبۆرینە*، زۆر جاران بەشێک (پیتێک) تا دواوشەی کار کرابوو، وەک دەمانگوت: لاپەڕە بەسرابوو بچێ بۆ چاپ. مامۆستا هەژار چەند وشەی تازەی دێنا و دەیفەرموو: «ئەوانەشی تێئاخنە!». جا وەرە چت کردووە، تێکی بدەوە و هەموو کارێ لەسەرڕا تێک بخەوە؛ نە جارێک و نە دوو جار ...!

٥. «**واچ**» یان «**فونیم**» phoneme یا «**واج**»ی فارسی، بچووکترین یەکەی دەنگناسییە کە مانای مورفیم و وشە دەگۆڕێ. وەک: /ب/ و /ش/ لە «**جووتۆکە**»ی «با» و «شا»دا. بۆ زمانی کوردی /ڕ/ و /ڵ/ واچن؛ وەک: لە دوو جووتۆکەی «کەر» (چوارپەلی بارەبەر) و «کەڕ» (نەبیس) و «گول» (نەخۆشی خۆرەتێکەوتوو) و «گوڵ» (بنچکەی گیا)دا دەردەکەون و مانا دەگۆڕن. لە عەرەبیدا ئەو دووە (/ڕ/ و /ڵ/)، ئەگەرچی دێنە سەر زار، بەڵام واچ نین؛ بەڵکوو «**واچناسا**» یان «**ئالۆفۆن**» allophone یا «**واجگونە**»ی فارسین. واتا: عەرەب هەر وەک «کەریم» و «ئیلاه»یان هەیە، «ڕەحیم» و «ئەڵڵاه»یشیان هەس؛ بەڵام ئەو زمانە گەورە، بۆ ئەو دوو نیشانە، جووتۆکەیەکی نییە. واتا: دوو وشەی وای تێدا نادۆزییەوە کە بە جێگۆڕکێ /ر/ و /ڕ/ یان /ل/ و /ڵ/، وەک لە کوردیدا دیتمان، مانا بگۆڕدرێ. کە وا بوو، لە ڕێنووسی عەرەبیدا بۆ ئەو دووە، نیشانەی تایبەت دانانرێ و «کَریم» و «رَحیم» هەر بە یەک ڕێ و «إلـاه» و «ألله» هەر بە یەک لام دەنووسرێ؛ وەک چۆن لە کوردیدا «س» لە وشەی «سەت» و «ت» لە وشەی «تاڵ»دا نابێ بکرێتە /ص/ و /ط/.

٢. **ڕیزبەندی**: ڕێچکەی ئەلفوبێی زمانی کوردی (بە دەنگ و کپەوە)[٦] بەم چەشنەیە:

ئـ ا ب پ ت ج چ ح خ د ر ڕ ز ژ س ش ع غ ف ڤ ق ک گ ل ڵ م ن و ۆ وو ە هـ ی ێ یی

کە لە خوارەوە وردتر لێیان ورد دەبینەوە. لێرەدا مەبەست ئاماژە بە لەخشەیەکە، هێندێک لە فەرهەنگەکانی گرتۆتەوە؛ *هەنبانە*ش یەک لەوانە.

ـ کام؟

ـ لە بەرچاو نەگرتنی ئەم ڕیزبەندییە، لە پیتی دووهەمی وشەکە بەولاوە. بۆ وێنە: ئەگەر بڕیارمان دا /ڕ/ پیتێکی سەربەخۆ (فونیم) بێ و جێگایشی پاش /ر/یە ، نابێ تەنیا لە سەرەتای وشەدا ئەمەمان لە بەرچاو بێ و لەوە بە دوا، ئەو دووە (/ر/ و /ڕ/) وەک یەک پیت چاو لێ بکەین و تێکەڵیان بکەینەوە. نموونەیەک: «بریان» و «بڕیان».

بەپێی ئەو تەرتیبە، دیارە بە دوای «بریان»دا نۆرەی «بریانی» و هەرچی وشەی تری وەک «بریقە» و «بریکە» و «بریڤان» و زۆرێکی ترە، تا دەگاتە «برێن». لێرەدا «بر...» کۆتایی پێ دێ و «بڕ» دەستپێدەکا. کەچی دەبینین هێندێک ئەم تەرتیبەیان لە بەرچاو نەگرتووە و «بریان» و «بڕیان»یان بە دووی یەکدا هێناوە!

ئەم ئاڵۆزییە تەنیا لە «...ر» و «...ڕ»دا نییە و «...ل» و «...ڵ»، «...و» و «...ۆ» و «...وو»، «...ـە» و «...هـ » و هەروەها «...ی» و «...ێ» شـی وەبەر داوە. ئێمە تەرتیبەکانمان تا دوایین پیت، ساغ کردەوە و هەموومان یەکبەیەک بردنەوە شوێنی خۆیان.

جا بۆ کەسێ کە بەو هەڵەوە ڕاهاتووە، تا بگەڕێتەوە سەر دەقی خۆی، هێندێکی هەر پێ دەچێ و دوور نییە بۆ وشەیەک ـ بە دابی پێشوو ـ بگەڕێ، نەیدۆزێتەوە و پێ وا بێ فەرهەنگەکە نەیگرتووە.

٣. **ئیملای لاتین**: بۆ هەموو سەرواژەکان، بەجێی فۆنێتیک، ئیملای لاتینیمان لە پەنا دانا.

ـ لەبەر چی؟

ـ بە دوو بۆنەوە:

**یەکەم**: دیارە هەر شێوەنووسینێ لە گوتن نزیکتر بێ، سەرکەوتووترە. ڕێنووسی کوردی بە نیشانەی عەرەبی (ئارامی) بە چەند بۆنەوە، لە فارسییەکە زۆر باشترە؛ لە هەموو گرنگتر

---

٦. ڕۆژاوا «vowel» و «consonant»ی پێ ئێژن؛ عەرەب «**مصوت**» و «**صامت**»؛ فارس کردوونی بە «**واکە**» و «**همخوان**». بە کوردی، «**کپ**» و «**دەنگ**»؛ ئەگەرچی پڕبەپڕی نییە؛ چونکوو «دەنگیلە» و «بزوێن» و «کورتەبزوێن» و...یشمان هەن.

ئەوەی کە دەنگیلەی کورت (ـَ ـِ ـُ) بۆتە پیت (ە، ی، و). ئەگەرچی ئەم کارە لـە بـاری دەنگناسییەوە هێندێک گرفت و لێڵی دروست کردووە و دەنگ و کپ تێکەڵ بـووە؛ بـەڵام وەک گوتمان بۆتە هۆی نزیک بوونەوەی شێوەی نووسین لەگەڵ ئاخافتندا.

لەو لاشەوە، وەک دەزانین لە کاتێکەوە دەوڵەتی تورکان ئـەلفبای عـەرەبی وە لا نـا و لاتینی لە جێ دانا، کوردی باکووریش بەوە فێری خوێندن بوون و دیارە کوردییەکەشـیان هەر بەو پیتە و لەسەر ئەو دەستوورە دەنووسن.

لە باری دەنگەکانەوە ـکە زۆر گرینگە ـ لاتینییەکە پێشـکەوتووترە؛ بـەڵام ئـەویش بـێ گرفت نییە و تا ئێستا بۆ هێندێک نیشانەی کپ لە زاری ناوەڕاستدا، ئالۆزی لـێ نەبـڕاوە و هەرکەسێ بۆخۆی بڕیارێکی بۆ داوە!

خالێکی تر باسی «کورتەبزوێن»ە کـە عـەرەب «کَسـرە مُختلسـە» و فـارس «مُصـوت کوتاە»ی پێ دەڵێن و لە خەتە عەرەبییەکەدا دەرناکەوێ؛ بەڵام خـەتی لاتـینی نیشـانەی تایبەتی /i/ بۆ داناوە و کاری هاسان کردۆتەوە. بۆ نموونە: «**گێسک** gêsk»، (بەچکـەبزنی لـە شیر بڕدراوە) یەک بڕگە و «**گێسک** gêsik»، (گەسک؛ گـزگ) دوو بڕگەیـە. دەبیـنین خەتـە عەرەبییەکە هیچ فەرقیان پێ ناکا؛ کەچی لە لاتینەکەدا جیاوازییان جوان دەرکەوتووە. کە وا بوو ئەگەر ئەو دوو ڕێنووسە لە پەنای یەک بن، زۆرێ لە لێلییەکان ناهێڵن.

**دووهەم**: ئەم جیاوازییە لە نێوان کوردی باکوور و بـاقی کـوردان، لـە سـەرینەی هـەموو کۆسپ و کەندالان، ئەمەشی لێمان زیاد کرد کە خەتی یەکترمان بۆ نەخوێندرێتەوە.

تۆ بڵەی ئەم فەرهەنگە، بە لە بەرامبەر یەک دانانی ئەو دوو ڕێنووسە، هێندێکمان لێک نزیکتر بکاتەوە؟

**ناو و شێوەنووسینی ئەلفوبێی زمانی کوردی، بە پیتی عەرەبی (ئارامی) و لاتینی:**

| ناو | شێوەی عەرەبی | شێوەی لاتین | نموونە | | دەنگناسی |
|---|---|---|---|---|---|
| هەمزە | ء/ ئـ | ' | ئاو | 'aw | کپ |
| ئەلف | ـا/ ا | A,a | نان | nan | دەنگ |
| بێ | بـ/ ـبـ/ ـب/ ب | B,b | باش | baş | کپ |
| پێ | پـ/ ـپـ/ ـپ/ پ | P,p | پان | pan | کپ |
| تێ | تـ/ ـتـ/ ـت/ ت | T,t | تیژ | tîj | کپ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| کپ | cêjn جێژن | C,c | جـ/ ـجـ/ ـج/ ج | جێ/ جیم |
| کپ | çak چاک | Ç,ç | چـ/ ـچـ/ ـچ/ چ | چێ |
| کپ | ħewş حەوش | Ħ,ħ | حـ/ ـحـ/ ـح/ ح | حێ |
| کپ | xas خاس | X,x | خـ/ ـخـ/ ـخ/ خ | خێ |
| کپ | day(i)k دایک | D,d | ـد/ د | دال |
| کپ | ser سەر | R,r | ـر/ ر | رێ |
| کپ | řoj ڕۆژ | Ř,ř | ـڕ/ ڕ | ڕێ |
| کپ | zemawend زەماوەند | Z,Z | ـز/ ز | زێ |
| کپ | j(i)yan ژیان | J,j | ـژ/ ژ | ژێ |
| کپ | sêw سێو | S,s | سـ/ ـسـ/ ـس/ س | سین |
| کپ | şew شەو | Ş,ş | شـ/ ـشـ/ ـش | شین |
| کپ | ‘eyb عەیب | ' | عـ/ ـعـ/ عـ/ ع | عەین |
| کپ | ğar غار | Ğ,ğ | غـ/ ـغـ/ غـ/ غ | غەین |
| کپ | fîşek فیشەک | F,f | فـ/ ـفـ/ ـف/ ف | فێ |
| کپ | v(i)yan ڤیان | V,v | ڤـ/ ـڤـ/ ـڤ/ ڤ | ڤێ |
| کپ | qurs قورس | Q,q | قـ/ ـقـ/ ـق/ ق | قاف |
| کپ | kar کار | K,k | کـ/ ـکـ/ ـک/ ک | کاف |
| کپ | gewre گەورە | G,g | گـ/ ـگـ/ ـگ/ گ | گاف |
| کپ | lêzme لێزمە | L,l | لـ/ ـلـ/ ـل/ ل | لام |
| کپ | p(i)ław پڵاو | Ł,ł | ڵـ/ ـڵـ/ ـڵ/ ڵ | ڵێ |
| کپ | mîwe میوە | M,m | مـ/ ـمـ/ ـم/ م | میم |
| کپ | naw ناو | N,n | نـ/ ـنـ/ ـن/ ن | نوون |
| دەنگ | kurd کورد | U,u | ـو | واو |
| کپ | wała واڵا | W,w | و/ ـو/ و | واو |
| دەنگ | pol پۆل | O,o | ـۆ/ ۆ | بۆرە |
| دەنگ | tû توو (تو) | Û.û | ـوو/ وو (ـو/و) | واوی درێژ |
| دەنگ | çü چـۆ | Ü .ü | ـۆ/ ۆ (تایبەتی باشوور) | |
| کپ | şeẅ شەۆ (کراس) | Ẅ,ẅ | ـۆ/ ۆ (تایبەتی باشوور) | |
| دەنگ | berd بەرد | E,e | ـە/ ە | سەرە |
| کپ | har هار | H,h | هـ/ ـهـ/ ھ | هێ |
| کپ | yar یار | Y,y | یـ/ ـیـ/ ـی/ ی | یێ |
| دەنگ | şîr شیـر | Î,î | ـیـ/ ـی/ ی | یێ درێژ |
| دەنگ | şêr شێر | ê | ـێـ/ ـێ/ ێ | یێ کراوە |
| دەنگ | nasik ناسک | i | دەرناکەوێ | بزرۆکە |

**تێبینی**:

**ئـ**. لە کوردیدا هیچ دەنگێک ناکەوێتە سەرەتای وشە و هەروەها سەرەتای بڕگەوە. واتا بۆ ئەوەی دەنگێک لە زار بێتە دەر و ببیسرێ، پێویستە کپێک سەرباشقەی بێ. بەم بۆنەوە ئەگەر هەرکام لـە دەنگـەکان، بـە ڕواڵـەت هاتنـە سـەرەتای وشـەوە، هەمزەیـەک ـ کـە کورت‌ترین کپە و کەم‌ترین کێشی هەیە ـ پێش دەکەوێ. وەک: ئـەو (ʼew)، ئـاو (ʼaw)، ئوسا (ʼusa)، ئوون (ʼûn)، ئۆقرە (ʼoqre)، ئێسقان (ʼêsqan)، ئیشک (ʼîşk) و ...

شیاوی باسە کە لە خەتی کوردی لاتینیدا، بە چاوبڕین لـە بـاقی خەتـە لاتینییـەکان، هەمزەی سەرەتای پێش دەنگەکان نانووسن. ئێمەش دیارە هەر وامان کـردووە و دابێکـی نوێمان دانەهێناوە. واتا: «ئاور»مان «awir» نووسیوە، نەک «ʼawir».

**ب**. لە خشتەکەدا، وەک دەبینین، لە بەرامبەر /و/ی خەتە عەرەبییەکەوە، دوو نیشانەی لاتینمان هەیە؛ یـەکیان دەنگـی /u/ و ئـەوی دیکـە کپـی /w/. ئـەوجار بـۆ دەنگـی /وو/ نیشانەی /û/، بۆ /ی/، دوو نیشانەی /y/ (کپ) و /î/ (دەنگ)مان هەن. ئەم جوێ بوونەوەی کپ و دەنگە لەو خەتەدا، چەند گرفتی گەورەی لابردووە.

**پێشنیار**: ئێستا کە بۆ دوو دەنگی واو و یێ کراوە (/o/ و /ê/)، بـزوێنی (٧)مـان دانـاوە و بوونەتە /ۆ/ و /ێ/، جێ خۆیە بۆ دوو دەنگی /û/ و /î/، بزوێنی (٨) دانین و ببنە /ۊ/ و /ٜ|/. بەم جۆرە هەم دوو واوی دزێومان لە کۆڵ دەکەوێ؛ کە لە بڕێ وشەدا وەک قـەتاری «و»، ڕیز دەبن (مووروو ، بووزوو)؛ هەم تێکەلاویی دەنگی /û/ لەگەڵ /w/ی کـپ و دەنگـی /î/ لەگەڵ /y/ی کپ نامێنێ و ئەو گرفت و ئاڵۆزییانەش کۆتاییان پێ دێ.

**هەنگاوێک**: کە دەزانین /وو/ نیشانەی یەک (واچ) فۆنیمـە، لـەم فەرهەنگـە و تـەنیا لـە سـەرواژەکاندا، ئـەو دوو واوەمـان هێنـدێک لێـک نێزیکتـر کردۆتـەوە و بـەم شـێوە /وو/ نووسیومانن. بەو هیوایە کە هەنگاوێک بێ بەرەو چارەسەرێکی یەکجارەکی.

**پ**. وەک لە دوو ڕزنی ٣٢و ٣٣دا دەبینین، زاری باشوور، دوو واوی کپ و دەنگی هەیـە کە لە خەتە عەرەبییەکەدا نیشانەی /ۊ/ و لە لاتینییەکەدا دوو نیشانەی /ü/ و /ẅ/یـان بـۆ داناوە. ئەگەرچی بۆ فەرهەنگ نووس نییە کە بڕیاری سەربەخۆ بدا و لە ڕێنووس شتێ زیاد یان کەم بکا، بەڵام بۆ ناساندنی ئەو تایبەتمەندییە، لێرەدا ئاماژەی پێ دەکەین.

**ت**. واوی بادانەوە (عطف) لە خەتی لاتینیدا، دەبێتە /û/. وەک: «کار و بار kar û bar»، «گیر و دار gîr û dar» و ... بەڵام کاتێ کە وشەی پێشوو، بە پیتێکی دەنگدار کۆتایی پێ هاتبێ، /û/ دەبێتە /w/. وەک: «باوبۆرانba w boran»، «ڕێوجێ rê w cê» و ...

**٤. دەوری ڕێزمانی**: دیارە وشەی وامان زۆرن کە بە یەک شێوەی نووسین و خوێندنەوە، بەپێی جێگەیان لە ڕستەدا، دەتوانن چەند دەوری ڕێزمانی جیاواز بگرنە خۆ. وەک:

**پڕ**[١] /piř/: ناو. ١. پڕایی؛ حەشامەت؛ خەڵکی زۆر ٢. چڵەکا؛ چڵەپووش ٣. هەڵمەت

**پڕ**[٢]: ئاوەڵناو. ١. تژە؛ تژی ‹گیرفانت پڕ کە!› ٢. تایبەتمەندی تەنراوی سفت و تووند ‹ئەم بەڕەیە باش چنراوە، پڕە› ٣. *[مەجاز]* زۆر زانا و دانا ‹مامۆستایەکی پڕە› ٤. تێر؛ مر

**پڕ**[٣]: ئاوەڵکار. زۆر؛ زاف؛ گەلەک ‹پڕ خوەشە›

**پڕ**[٤]: ئامراز. پڕی؛ پڕ بە ‹پڕ گیرفانم نابێ›

**پڕ**[٥]: پێشوشە. ١. زۆر ـ؛ فرە ـ ‹تا شاد نەبم بە مەرحەمەتی کیمیایی تۆ/ بوونی بە زەڕ مەحاڵە مسی قەلبی پڕغەشم «بێخود»› ٢. لیپ؛ سەرڕێژ ‹لە سینە جۆششی نالینە، چاوە پڕنەسرین/ زِ یُمن جور تو اقلیم درد آباد است! «مەحوی»›

**· پڕ**[٦]: پاشەوشە. ١. ـ پەڕ؛ پەڕان ‹وەرپڕ› ٢. بە دوای ناوەوە دەنووسێ و ئاوەڵناو دروست دەکا، مانای خاوەن شتی زۆر و پێویست یان هەڵمساو دەدا ‹دڵپڕ؛ دەستپڕ؛ زگپڕ› ٣. بە دوای پیتەوە، ئاوەڵکار ساز دەکە ‹لەپڕ›

**پڕ**[٧]: پێڕۆ. ← **کوتوپڕ؛ تێروپڕ**

**پڕ**[٨]: لێل. ← **پڕوپیرەژن**

بەم نموونەدا دەردەکەوێ کە بۆ فەرهەنگێک، دەرخستنی ئەم تایبەتمەندییە و دەرکەوتنی باری گەڕانی زمان، تا چ ڕادەیەک پێویستە.

دەوری ڕێزمانی دیاریکراو لەم فەرهەنگەدا بریتییە لە:

١. چاوگ (مصدر) ٢. ناو (اسم) ٣. ئاوەڵناو (صفت) ٤. ئاوەڵکار (قید) ٥. جێناو (ضمیر) ٦. ئامراز (حرف) ٧. کار (فعل) ٨. دەنگ (صوت) ٩. دەنگەناو (اسم صوت) ١٠. پێشوشە (پیشواژە) ١١. پاشەوشە (پیواژە) ١٢. پێشگر (پیشوند) ١٣. نێوانگر (میانوند) ١٤. پاشگر (پسوند) ١٥. هەڵەی باو (غلط مُصطلح) ١٦. بێشناسەی ڕێزمانی (کە وێڕای فیعل دەگوترێ و بە تەنیا ناچێتە کار) ١٧. سارستە (شبەجملە) ١٨. پێڕۆ (تابع) ١٩. لێل (مُهمل)

لەوانە، چەند دانەیان ڕوون کردنەوەیەکیان دەوێ:

**چاوگ**: بە بڕوای زۆرێ لە زمانناسان، چاوگ ڕیشە و بنەمای زمانە. تا دەستی دابێ، چاوگمان لە چاو دانەخستووە و لەسەر چاوگە زیاتر ناسراوەکان، لە زمانی یەکگرتوومانـدا، زیاتر وەستاوین و زۆرترمان شی کردوونەوە و تێپەڕ و تێنەپەڕ و ئاوەڵناوی بەرکار و چاوگی مەنفیشمان بۆ نووسیون. وەک:

**بوون** /bûn/: چاوگ. تێنەپەڕ. //بووی؛ دەبی؛ ببە// ١. هەبوون ‹بوون و نەبوون و مان و نەمان تۆ حەقشناس!/ جەبرە و بە مەیل دڵبەرە، کەی ئیختیارییە؟ «حەقشناس»› ٢. بە شێوازێ

دەرهاتن ‹تا شاد نەبم بە مەرحەمەتی کیمیایی تۆ/ بوونی بە زەڕ مەحاڵە مسی قەلبی پڕغەشم «بێخود»› ٣. هاتنە دنیا؛ لە دایک بوون ‹بە حەق هەر حەق، بە ناحەق ناحەقم وتووە لە ڕۆژێ بووم/ وەکوو مەنسوور ئەگەر بیشمکوژن، ناکەم لە حەق لادەم «مەحوی»›

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: بوو/ چاوگی نەرێنی: نەبوون

واتا: پێشەکی، تێپەڕ (مُتعدی) یا تێنەپەڕ (لازم) بوونی چاوگی لێما دەرکەوتووە؛ پاشان دارِشتەی دووهەم کەسی تاک، لە سێ باری ڕابردووی ساکار (ماضی مُطلق)، ڕانەبردوو (مُضارع) و فەرمان (امر)دا نووسراوە و ئەوجار چاوگەکە هاوواتای بۆ داندراوە و مانا کراوەتەوە. لە کۆتاییشدا ئاوەڵناوی بەرکار (صفت مفعولی) و چاوگی نەرێنی (مصدر منفی) بۆ نووسراوە.

جا ئەگەر چاوگێک هەم دەوری تێنەپەڕ ببینێ و هەم تێپەڕ، ئاوامان بۆ کردووە:

**هەبون**[١] / hebûn /: چاوگ. تێنەپەڕ. تێپەڕ. //هەبووی؛ دەبی؛ ببە// هەبین: □ تێنەپەڕ. ١. دژی نەبوون ‹بێخود بە کردەوە و قسە، خاکم بە سەر، وەهام/ هەر وەک دەم و جنێوی بتان نیشم و هەشم «بێخود»› □ تێپەڕ. ٢. خاوەنی شتێ بوون ‹با هەزار زێ و گادەر و لاوێنی ڕوونیشمان هەبێ/ تاکوو ژن ئازاد نەبێ سەرچاوەکەی ژین لیخنە «هێمن»›

**تێبینی**: وەک دەزانین زۆربەی دارِشتەکان بە دوان و چوار و جاروبار، دە و دوازدەشەوە ناوەستن! ئێمە بۆ هەڵبژاردنی تاکێک لەو خێڵە، سێ خاڵمان بەرچاو گرتووە: ١. نزیکتر بوون لە زمانی یەکگرتوو ٢. کورت بوون ٣. دۆخی ئاسایی؛ نەک بەپێداگری یان سکالا یان ئالۆزی یان ... بۆ نموونە لە چاوگی «هاتن»دا، کارمان بە باکوور و باشوور و هەورامییەوە نەبووە. لە ناوەڕاستیش بۆ دارِشتەی دووهەم کەسی تاکی ڕانەبردوو، ئەمانەمان هەن: «دێی»، «تی»، «تێی»، «یێی»، «تیت» و ...

بەپێی ئەو دەستوورە، یەکەممان داناوە و لە باقی وازمان هێناوە.

ئەوجار لە دارِشتەی چاوگە تێپەڕەکاندا، پیتی جێناو ـ کارا و بەرکارـ بۆیان هەیە دەرکەون. ئێمە چووینەتەوە سەر شێوازی سەرچاوە و لق و پۆمان بەرداوە. بۆ نموونە چاوگی «دامەزراندن»مان، ئاوا سەرف کردووە:

/داتمەزراند، دادەمەزرێنی، دامەزرێنە/

کەچی: /داتمەزراند، دایدەمەزرێنی، دایمەزرێنە/ و ... شمان هەیە.

**دەنگەناو**: فارس «نام‌آوا»ی پێ ئێژن و بریتییە لە ناوێ کە لە دەنگی سروشتی گیراوە. وەک: بارە؛ واقەواق. کە لە ڕستەدا دەردەکەوێ ئاخۆ «دەنگ»ە یان «دەنگەناو»؟ کورد دەڵێ: «بارەی دێ؛ واقەواق دەکا».

**هەڵەی باو**: وشەیەکە داتاشراوە و بۆتە باو؛ ئەگەرچی لە باری ڕێزمانی و لە چاوی چوارچێوەی زمانییەوە هەڵەیە. وەک: «بەروار» بۆ مێژووی مانگ و سال، «پاکەوان» بۆ سپوور (رُفتگر)، یان «چاپەمەنی». هەڵەی باومان بە نیشانەی (!) لە پەنایدا، نیشان کردووە.

**بێ شناسەی ڕێزمانی**: ئەگەر وشەیەک بە تەنیا نەگوترێ بەڵام وێڕای فیعلێک بچێتە کار یان لێکدراوی لێ ساز ببێ، هاتۆتە ئەم ڕیزەوە و بە فلشێکی بەرەو خوار، ڕێنوێنی کراوە بۆ لێکدراوەکانی. وەک: وشەی «پەک» کە «پەک بوون»، «پەک کەوتن» و ... مان هەن، بەڵام بە تاق، چ لە باری مانا و چ لە باری ڕێزمانەوە، لێڵ و ناتەواوە. دوو نموونەی تر: «توورِ» و «تەریق»، کە پێویستە لایەنێکی سەرفییان ڕەگەڵ کەوێ تا بگوترێن؛ واتا ببنە: «توورِ دان» و «تەریق بوونەوە» یان «تەریقەوە بوون» و ...

**پێرۆ**: بە وشەیەک دەگوترێ کە بە شوێن وشەیەکی تردا، دوای واوێکی بادانەوە دێ و پێکەوە واتایەکی تایبەت دروست دەکەن؛ کەچی بە تەنیا یا هەر مانایەکی نییە یان واتایەکی تری هەیە. وەک: «ئۆخر» و «هاج» و «بان» و «کار» لە «ئاخروئۆخر»، «هاروهاج»، «جێوبان» و «کەس‌وکار»دا.

**لێڵ**: وشەیەکە بێ‌مانا یان بە مانایەکی جیاوازەوە کە پێش وشەی تر دەکەوێ و پێکەوە مانایەک ساز دەکەن. وەک: دوو وشەی «برِ» و «پرِ» لە «برِوبیانوو» و «پرِوپیرەژن»دا.

٥. **باری مانایی**: جاروبار لێمایەک یان یەک لە ماناکانی، بارێکی تایبەت دەگرێتە خۆی و بۆ ڕاگەیاندنی واتایەکی سەربەخۆ دەکار دەچێ؛ کە زیاتر لەم بوارانەدایە: مەجاز؛ کینایە، ئەدەبی، ناشیرین، شوورەیی و پلار و هەروەها نزا و تووک و جنێو.

لەم فەرهەنگە، باری مانایی لە نێوان دوو قولاودا دانراوە. وەک:

**پاک بوونەوە** پا بوونەوە: ١. خاوێن بوونەوە؛ پیسی و پۆخڵی پێوە نەمان ‹چەندی دەیشۆم پاک نابێتەوە› ٢. *[مەجاز]* لە ناو چوون؛ نەمان ٣. *[پلار]* مردنی بەدفەرِ ‹کەنگێ ئەو زالمە پاک دەبێتەوە؟› ٤. *[مەجاز]* خەلاس بوون لە ئەرک و مەینەت ٥. *[کینایە]* لە پۆنی دەرهاتنی ژن؛ بێ‌نوێژی نەمان

**تێبینی**: زۆر جار باری مانایی لە لێکدراوە ناوی و بەتایبەت فیعلییەکاندا دەردەکەوێ کە لە شوێنی خۆی باسی دەکرێ.

٦. **بواری بەکارچوون**[٧]: شێوەی ژیان و بیر و بڕوا و ڕادەی زانست و چۆنیەتی کار و پیشەی هەر کۆمەڵگایەک، لە زمانەکەیدا ڕەنگ دەداتەوە. هەموو زمانێک وشەی وای تێدان کە لە بوارێکی تایبەتدا دەچێتە کار یان لە بوارێکی تایبەتدا، واتایەکی سەربەخۆی هەیە. ئەم بوارانە بریتین لە زانستی، وەک: فیزیک، کیمیا، گیاناسی، ڕەوانناسی و ... یان ئایینی، وەک: ئیسلام و ... یا فەرهەنگی خەڵکی و ... بەکورتی، لەم فەرهەنگە ٣١ بوارمان دیاری کردووە. بواری بەکارچوونیش هەر لە نێوان دوو قولاودایە. وەک:

**پێپیرۆزانە** / pêpîrozane/: ناو. *[فەرهەنگی خەڵکی]* دیارییەک کە بە بۆنەی لە دایک بوونی کەسێکەوە دەدرێت ‹پێپیرۆزانەی کەس بۆ ناهێنێ/ هیچ کەس بە چاکە هەرگیز نایدوێنێ «قانع»›

٧. **هاوواتا و شرۆڤە**: لەم فەرهەنگەدا بۆ هاوواتا دانان و شرۆڤە کردنی سەرواژەکان، بەپێی ڕادەی بە کار چوونیان لە زمانی یەکگرتووی کوردیدا، سێ پلەکمان لە بەرچاو گرتووە:

**یەکەم، سەرەکی**: بۆ وشەی وا، سەرەتا چەند هاوواتا و ئەو جار شەرحێکی کورت و بەسندەمان بۆ نووسیوە و ئەگەر گونجابێ، لە کورتەڕستە یان بەیتێکدا، لە باری نەحویشەوە ناساندوومانە. ئەگەر وشەکە دوو یان چەند مانای هەڵگرتبێ، بۆ هەرکام بە جیا ئەم کارەمان کردووە و تەنانەت بۆ دەرکەوتنی جیاوازیی واتاکان، ئەگەر دەستمان کەوتبێ، بەیتێک شیعر یان ڕستەیەک پەخشانمان بۆ بە شاهید یان نموونە هێناوەتەوە. لە کۆتاییشدا، واتای فارسی. وەک:

**باس**[١] / bas/: ناو. واس: ١. ڕەوتی لێدوان؛ قسە کردن ‹باسی شەو مەکە! نە شایەری شەوم «سوارە»› ٢. خەبەر؛ هەواڵ ‹کە تۆ هاتی لە نەومیدی نەما باس/ لە هیجر و ئینتیزار ئیدی نەما باس «نالی»› ٣. بابەت ‹باسی زولفی درێژ و چاوی بەخەو/ نەبڕاوە، بووە تڕی خەسرەو! «حاجی قادر»› ٤. *[مووسیقا]* دەنگی گڕی گۆرانیبێژی پیاو ٥. *[مووسیقا]* بەگرمەترین و گەورەترین سازی ژێدار لە ئۆرکێستردا ☰ ١. بحث ٢. خبر ٣. موضوع ٤و٥. باس

**دووهەم، ناوەندی**: هاوواتایەک، دوان (لە پلەکی یەکەم)مان لە بەرامبەریدا داناوە و ئەگەر پێویستمان زانیبێ، بە نیوڕستەیەک ناساندوومانە. وەک:

**ئەڵەند** / ełend/: ناو. کازیوە؛ ڕووناکی بەرەبەیان ☰ سپیدە

**سێهەم، نزم**: بە قامکێک خوێنەرمان ڕێنوێنی کردۆتە سەر هاوواتایەکی لە پلەکی یەکەمدا. وەک:

**ئەڵووژە** / ełûje/: ☜ **هەڵووژە**

---

٧. بە فارسی: «حوزەی کاربُردی».

شیاوی باسە لە ڕابردوودا فەرهەنگەکان پێشتر لێماکەیان شەرح دەکرد، ئەوجا وشە هاوواتاکانیان بۆ دەنووسی. ئێستا بە دوو بۆنەوە پێچەوانەیان کردۆتەوە: یەکەم، بۆ زووتر بە ئامانج گەیشتنی خوێنەر؛ کە دوور نییە هەر بە دیتنی هاومانایەک یان یەک لە هاوماناکان، بە نیازی بگا و پێویست نەکا شرۆڤە بخوێنێتەوە و کاتی بڕوا. دووهەم، دەرکەوتووە وشە، بە وشە فێر بوون، مانەوەی لە مێشکدا زۆرترە و هەروەها مێشکی خوێنەری پێ باشتر ڕادێ. ئێمەش بە ڕەچاو کردنی ئەم ئامۆژگارییە، مەگەر هاوواتایەکی پڕبەپڕمان شک نەبردبێ، دەنا سەرەتا هاوواتامان هێناوە، جا شەرحمان کردووە.

١-٧. **هاوواتا**: زۆربەی وشەناسان دەڵێن هیچ دوو وشەیەک لە هیچ زمانێکدا، بە تەواوی هاوسەنگ نین. بەو حاڵەش کەم نین دوو یان چەند وشەی وا کە لە بارێک یا چەند باری مانابییەوە ـکەم تا زۆرـ هاوواتا دێنەوە. وەک: چاوگی «**دەرچوون**»، کە چەند مانای هەیە و هەرکام لەگەڵ چەند وشەی تردا هاوواتان:

١. ڕا کردن؛ هەڵاتن ‹تا ماڵەوە دەرچووم› ٢. دەرپەڕین؛ دەرزەنین؛ ڕاپسکان؛ بە شێوەی نەخوازراو بەر بوون ‹دەرچوونی تیر؛ لە دەست دەرچوون› ٣. ترازیان؛ لە جێ چوون؛ لە جێی خۆ دەرهاتن ‹شانم دەرچوو› ٤. نیشتن؛ تێچوون ‹بۆمان بە ملیۆنێ دەرچوو› ٥. قەبووڵ بوون؛ وەرگیران ‹بە نمرەی باش دەرچووم›.

لە سەرینەی ئەوەش، بۆ زمانێکی بەربڵاوی وەک کوردی، بە چوار زاری گەورە[8] و دەیان شێوەزار[9] و سەتان بنزارەوە،[10] زۆر ئاسایییە شتێک لە ناوچەیەک ناوێکی هەبێ و هەر ئەو شتە بە عەینی ناوەرۆکەوە، لە شوێنێکی تر، بە ناوێکی تر بیناسن. نموونەی وا هێندە زۆر و ئەمەندە ئاشکرایە، پێویست بە وێنە هێنانەوە ناکا. بەڵام جاروبار دەبینی یەک وشە، لە دوو یان چەند شوێن، دوو یا چەند مانای هەیە. وەک: «**هاڵێ**»، لە شوێنێک بە «بەرسیلە» یان «قۆرە»ی دەڵێن؛ کە ترێ نەگەیشتووی کەسک و ترشە. لە شوێنێکی تر، هەمان «هاڵێ» ترێ گەیشتووی زەرد و شیرینە![11]

---

٨. سێ زاری کرمانجی باکوور و ناوەڕاست و باشوور و زاری هەورامی و زازایی.

٩. وەک سێ شێوەزاری سۆرانی، موکوریانی و ئەردەڵانی، لە زاری ناوەڕاست.

١٠. وەک سێ بنزاری هەولێری و مەهابادی و سنەیی لەو سێ شێوەزارە.

١١. دەگێڕنەوە: جافێک سندووقێ ترێ وەک زێڕی باخەکەی برد بۆ شاری پاوە و لە سەر ڕێگایەکی دانا، بیفرۆشێ. یەکێک بەوێدا دەچوو، پرسی: «گیان! ئا هاڵێ کیلوێ چننە؟» کابرا تووڕە بوو، سوێندی خوارد: «لە برسیشا بمرم، هەنگوور (ترێ) خوەم لەم شارە نافرۆشم»!

هەر سەبارەت بە «ترێ»: دەنکەترێ، واتا: «گلار» یا «لبە»، لە سنە و زۆر شوێنی تر پێ ئێژن «بۆڵ»؛ کە چی بەشێ لە موکوریان و سۆران، وەکوو بانە و سەقز و مەریوان و پێنجوێن، «بۆڵ» هێشووەترێیە.

ئەم دوو نموونە، وەک مشتێ لە دەشتێ و پەڕێ لە پەڕتووکێ، ئەوەمان بۆ دەردەخا کە ئەگەر بتوانین بە دڵنیاییەوە بێژین: «ئەم وشە لای ئێمە، مانای ئەوەیە»، بەربڵاوی زمانەکەمان ڕێ نادا بڵەین: «هەر ئەوەیە و هیچی تر نا».

**تێبینی**: هێندێک جار دوو یان چەند وشەی وا هەن کە لە یەک ڕیشەن و لە ڕاستیدا هەر یەکن؛ بەڵام لە شوێنێک بێژەیەکی هەیە و لە شوێنێکی تر، بە نەختێک جیاوازییەوە، بێژەیەکی تر.[12] ئەمانە خزمانێکی لە هاوواتا نزیکترن و «ئەبدال»یان پێ دەڵێن. ئەبدال تایبەت بە زمانێک نییە و لە هەموو زماناندا، کەم و زۆر هەن؛ بەڵام لە زمانی کوردیدا، بە هۆی پرژوبڵاویمانەوە، زۆر پەرەی ساندووە و بۆخۆی کتێبێکە.

ئێمە لەم فەرهەنگەدا ئەبدالمان لە هاوواتا (هاومانا) جیا نەکردۆتەوە؛ وەک لە هیچ فەرهەنگێکی گشتیدا نایکەن. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ دژواری و جێ کێشە بوونی کارەکە؛ ئاخۆ کام وشە سەرەکی و کامانە ئەبدالن؟ پێومانمان بۆ ئەم بڕیاردانە چییە؟ هەروەها ئەگەر وشەی سەرەکیشمان ناسییەوە، ئەبدالەکانی کامەن و چۆناوچۆن دڵنیا بین لە جیا کردنەوەی ئەبدال و هاوواتادا؟

بۆ نموونە: ئاشکرایە کە ئەم وشانە هەموو لە یەک ڕیشەن: ئاگر؛ ئێگر؛ ئاگەر؛ ئاگور؛ ئاور؛ ئاویر؛ ئاتر؛ ئاتەر؛ ئایر؛ ئایەر؛ ئادر؛ ئاڤر؛ ئار؛ ئاهر؛ ئاهیر؛ هایر؛ ئەیر؛ ئێر؛ ئارگ و ...

ئەمجار پرسیارەکە ئەوەیە: کامیان وشەی سەرەکییە؟ ئاگر؟ ئاور؟ یان هیچیان؛ یەکێکی تر لەو خێڵە؟ ئەوجار ئەگەر «هایر» ئەبداڵە، ئەی «هەتار» و «هاتەر» چی؟

**٢-٧. شرۆڤە**: ڕاژەی ڕەوا بۆ فەرهەنگ، لەگەڵ پوخت و پاراویدا دەبێ کورت و موختەسەریش بێ. کورتبڕی[13] بۆخۆی بەڕاستی هونەرێکە. مەرجیشی ئەوەیە بە کەمترین وشەوە، هەموو مەبەستەکە ڕاگەیێنێ و هیچێکی لێ نەفەوتێنێ.[14]

---

١٢. «بێژە» بۆ «تَلَفُّظ»ی عەرەبی.

١٣. «کورتبڕی» لە بەرانبەر «درێژدادڕی»یەوە، بۆ «ایجاز».

١٤. دەڵێن: داوایان کرد لە فرانکلین ڕووزڤێلت (١٨٨٢- ١٩٤٥ز.)، سەرۆک کۆماری ئەمریکا، لە بارەی ڕووداوێکەوە پێنج خولەک قسەیان بۆ بکا. گوتی: چەند ڕۆژم کات بدەنێ. گوتیان: ئەی ئەگەر بمانەوێ سەعاتێک لەو بارەوە قسە بکەی چی؟ گوتی: هەر ئێستا ئامادەم!

شەرحی فەرهەنگ پێویسـت ناکـا بـە ڕسـتەیەکی تـەواو بـێ و ئەگـەر نیوڕسـتەیەک کارەکەی جێبەجێ کرد، ئەوە باشتر. بۆ نموونە ڕستەی «ناوی گوڵێکی گچکەیە بـەهاران سەر هەڵدەدا» باشترە ببێتە: «گوڵێکی گچکەی بەهاری».

**٨. شاهید و نموونە**:

١-٨. **شاهید** دەقێکی وێژەیی یان فولکلۆرییە کە تێیدا وشـەی لێمـا، بـەو مانـا و دەوری ڕێزمانییەوە بەکار چووە کە لە فەرهەنگەکـەدا بـۆی نووسـراوە و فەرهـەنگنـووس وەکـوو بەڵگەیەک، بۆ جوانتر دەرکەوتنی مانا و باری ڕێزمانی ئەو وشە لە زمانەکەدا، نیشانی دەدا. ئەو دەقە دەکرێ بەیتێ، ڕستەیەک لە شاعیر یان نووسەرێکی خـاوەن نـاو، یـا مەسـەلێ، قسەی نەستەقێ یان پەندێکی پێشینان بێ.

لەم فەرهەنگەدا تا ڕادەیەکی بەرچاو شاهید هێنراوەتەوە و ناوی بێژەریـان لـە پـەنایان نووسراوە. لێرەدا چەند تێبینی هەن:

**یەکەم**: جاروبار شیعرێکی شاعیرێ یان ڕستەیەکی نووسەرێ زیاتر لە جارێ بە شـاهید هاتۆتەوە. تەنانەت هەڵکەوتووە بۆ یەک وشە، بە دوو باری ڕێزمانییەوە، هـەر یـەک ڕسـتە داندراوە. دیارە بەم جـۆرە خوێنــەر جـوانتر جیـاوازی نێـوان واتاکـانی ئـەو وشـەیەی بـۆ دەردەکەوێ. وەک: بەیتێکی مەحوی بۆ مانای ٧ی «خۆش بوون» و «خۆش ویستن».

**دووهەم**: وەک گوترا لە پەنا هەر ڕستە و شیعرێکدا نـاوی نووسـەری نووسـراوە و بـەس؛ بێجگە مامۆستا هەژار، کە بە بۆنەی بەربڵاوی بەرهەمەکانییەوە، ناوی ئـەو بەرهەمـەشمان هێناوە کە شاهیدەکەی لێ وەرگیراوە.

٢-٨. **نموونە**، بریتییە لە ڕستە یان نیوڕستەیەک کە فەرهەنگنووس خـۆی دەینووسـێ و زیاتر بۆ دەرخستنی جیاوازی دەوری ڕێزمانی و هـەروەها دەوری پێشـگر و پاشـگرەکانە. ئێمە زۆرێک لە نموونەکانمان لە *هەنبانە*وە هێناوە.

٩. **بەشی فارسی**: باس لە سەر پێداویست بوون یا نەبوونی ئـەم بەشـە بـۆ فەرهـەنگێکی کوردی، دوورودرێژە و دەگەڕێتەوە بۆ کاتێ کاری نووسینی *هەنبانە بۆرینە* دەستی پێ کرد. ئەوی ڕاست بێ، یەکەم دژی ئەم کارە، مامۆستاهەژار بوو؛ کە لە پێشـەکییەکەیدا ئامـاژەی پێ کردووە و وەکوو کارێکی بێگار ناوی لێ بردووە! ئەڵبەت کە *هەنبانە* لە چاپ دەرهـات، سەرەتا هەرایەک ساز بوو لە دژایەتی لەگەڵ فارسی هێنانە ناو فەرهەنگێکی کوردییـەوە و هەمووشی بـە دروسـتی، بـە سـەری منـدا شـکایەوە و خـەریک بـوو، سـنەیی گوتـەنی: «بێکەس کوژ بم!» بەڵام پاش ماوەیەک دەنگی پشـتیوانیش هەڵـیدا و زۆرێـک پـێ ڕازی

بوون و خێریان لێ دی!.

قسەی نەیارانی ئەم بەشە، بەکورتی ئەمانەیە:

ـ دان بە ناتەواوی و بێهێزوپێز بوونی زمانی کوردیدا نانە و لە ڕاستیدا سووکایەتی کردنە بەو زمانە. واتا: ملمان کەچ کردووە و پێهاتووین کە ئەگەر ئەو بەشە فارسییە نەبێ، کارمان لەنگە!

ـ بۆ دەبێ هەموو شتێکمان بەلاجەوی بێ؟ کوا لە هیچ زمانێکدا شتی وا؟ فەرهەنگ، داب و دەستوورێکی هەیە و کاری نەداوە بەوەی بە چ زمانێکە. ئەگەر جووتزمانە، چاوێک لە فەرهەنگی جووتزمانی خەڵکی تر بکەین؛ حەرام بێ شتێ وا لە هیچ کوێ نابینی و لە هیچ کتێبخانەیەک نایدۆزییەوە.

ـ باشە، بۆ فارسی؟ ئەگەر هەر فەرزە بەرامبەرێک هەبێ، بۆ عەرەبی یان زمانی دنیاداگرتووی ئینگلیسی نەبێ؟

**لە وەرامدا**: پێش هەموو شتێ، بۆ کەسێ قەڵەمی گرتە دەستەوە، زیاد لەوەی کە دەبێ بزانێ چ دەنووسێ، پێویستە بشزانێ بۆ کێی دەنووسێ. کەس هەیە دان بەوەدا نەنێ کە ئێمەی کوردی خوێندەواری ڕۆژهەلات، فارسییان پێ خوێندوین و زۆربەی زۆرمان یا هەر سەوادی کوردیمان نییە یان دەسەلاتی کوردی خوێندنەوە و کوردی نووسینمان، لەچاو فارسییەکە، زۆر کز و لاوازە؟ ئەو کارەساتە تاوانی کێیە و دەبێ بەرۆکی کێ بگرێ، لە جێ خۆی؛ لێرەدا پرسیارەکە ئەوەیە: تۆی فەرهەنگنووس دەبێ بەو دەردە بزانی؟ یان شیاوە بە لووتبەرزییەوە خۆتی تێ نەگەیەنی؟ نەوەک وەجی کۆمەلایەتیت ڕووشەیەکی تێ بکەوێ!

من پێم وایە چاوپۆشین و گوێئاخنین، هیچی لێ شین نابێ و پێویستە بە بێ ترس و بەخۆداشکانەوە، دەست بۆ دەرد و نەخۆشیمان بەرین و بیناسین؛ ئەوجار بە ڕاشکاوی بچینە مەیدانییەوە، بەشکوو بیبەزێنین.

ـ ئەوەی کە من زمانێ بزانم یان نەزانم، چی بەسەر زمانەکەوەیە؟ سووکایەتی بە زمانی کوردی بۆ؟ کاکە من وشەیەکم بیستووە، نازانم مانای چییە یان ماناکانی تری کامەن؛ تۆ بە هەر شێوەیەک و زمانێک بتوانی خێراتر و باشترم تێبگەیەنی، ماڵت ئاوا. ئیتر سووکایەتی بۆچی و کوا لێرەدا جێ باسە؟

ـ ئەوجار دەفەرمووی سەیر و سەمەرەیە و لە هیچ زمانێکی تردا شتی وامان نییە. بەڵێ، ئەمە ڕاستە. ناشوکری نەبێ سەیر و سەمەرەمان زۆرن. سەیروسەمەرە نییە چل ـ پەنجا ملیۆن بەشەر لەو دنیایەدا بژین، منداڵەکانیان نەتوانن بەو زمانە قسەیان لەگەڵ

کردوون و قسەکردن فێر بوون، خوێندنەوە و نووسینیش فێر ببن؟ مـن لەگـەڵ عـەرەب و ئینگلیسیزماندا هەڵدەسەنگێنی؟ چی بەسەر چییەوە؟

بە کورتی: ئەم فەرهەنگە ـ ئەگەر کارمـان بـە فارسـییەکەیەوە نـەبێ ـ بـە نـاوەرۆک فەرهەنگێکی کوردی ـ کوردی تەواوە و تا دەستی دابێ کۆششـمان کـردووە لـەم بـوارەدا هەنگاوێ بەرەو پێش بێ. ئەمجا لە کۆتاییدا بەرامبەرێکی فارسیشمان دانـاوە بـۆ ئەوانـەی دوای خوێندنەوەی ئەو هەموو ڕاژە و ڕاڤەیە، هێشتا جوان لـێ تـێنەگەیشـتوون؛ بەشـکوو بەوە تێبگەن؛ کە بە بەراوردی من، بە داخەوە، کەمیش نین.

بەو حاڵەش، بۆ ڕێزگرتن لەو بیروڕایە، بەنیازین جارێکیش بە بێ فارسییەکەی لە چاپی بدەین؛ بزانین خوێنەران کامیان پەسندترە.

١٠. **لێکدراوی ناوی و کاری (فیعلی)**: بەشێک لە دەوڵەمەندی زمان، ڕادەی بـەرفراوانی ئـەم پێکهاتە و لێکدراوانەیە. زۆرێک ناوی تایبەت و نوکتە و پەنـد و مەتەڵـۆک و دەسـتەواژە و قسەی نەستەق، لە ڕاستیدا یا لێکدراوێکی کاری، یان بەشێک لە لێکدراوێکی ناوین. ئەوی لەم لێکدراوانەدا زۆر گرنگە، باری مانایی تایبەت وەخۆ گرتنیانە.

ـ چۆن؟

ـ بۆ نموونە: «ئاو» ناوێکە بە چەند ماناوە؛ بەڵام ئەگەر لەگەڵ وشەی «ڕەش»دا لێک درا، واتا «ئاوی ڕەش»، نەخۆشییەکی حەستەمی چاوە. هەروەها «ئاو» لە دەسـتەواژەی «ئـاو لـە دەس نەتکان»دا، واتایەکی کینایی ساز دەکا و ئاماژەیە بـە زۆر ژڕد و چکـووس بـوون. وەک دەبینین ئەم لێکدراوانە، هیچ خزمایەتییەکیان لەگەڵ «ئاو» و ماناکانیدا نییە.

لە *هەنبانە*دا بڕێک لەم لێکدراوانە هاتوون؛ بەڵام وەکـوو سـەرواژە و جـوێ نەبوونەتـەوە. ئێمە زۆرێکمان لێ زیاد کردوون و وەک ژێرلێما، بە دوو نیشانەی ▣ و ◘ دەرمانخستوون؛ ئەگەرچی دەزانین ژماریان یـەکجار زۆرە و دەگونجـێ لـە فەرهـەنگێکی سـەربەخۆدا کـۆ بکرێنەوە.

١١. **گیا و گیانـەوەر**: بەشێک لـە فەرهـەنگێکی گشـتی (عمـومی)، سـەبارەت بـە گیـا و گیانەوەرانە. ئێمە زیاد لە *هەنبانە*، بۆ چەند سەرچاوەی تایبـەتیمان ڕوانی و دوو پسـپۆڕی ئەم دوو بوارەش، پێیدا چوونەوە. بەو حاڵەش بـۆ هێنـدێک، نـاوێ زیـاتر، هیچمـان دەس نەکەوت و تەنانەت نێوڕستەیەک شەرحمان بۆ نەدیتنەوە. دیارە ئەوەش بۆ داهاتوان!

## نیشانەی بەکارچوو لەم فەرھەنگەدا

| نیشانە | نیشاندەر |
|---|---|
| . (خاڵ) | پاش دەوری ڕێزمانی و ژمارەکان |
| ، (بەند، کاما) | کورتەوچان |
| ؛ (خاڵبەند) | پاش وشەی هاوواتا |
| : (دووخاڵ) | پاش لێما (مەدخەل) و لێکدراوەکانی و دوای «وەک» بۆ شرۆڤە |
| ؟ | پرسیار |
| ! | ١. سەیرمان ٢. ڕوو تێکردن ٣. پێداگرتن ٤. هەڵەی باو |
| - | نێوان دوو بەشی لێکدراوێکی بەتایبەت ئاوەڵکاری |
| - - | لەخۆگری ڕستەی ڕاژەیی |
| ( ) | شرۆڤەی زیاتر |
| [ ] | باری مانایی، بواری بەکار چوون |
| / | یا، یان |
| / / | لەخۆگری ئیملای لاتینی لێما، نیشان دانی واچ (فونیم)ێک |
| // // | سەرفی چاوگ |
| ☚ | بڕوانە بۆ: |
| ↓ | لە خوارەوە بیناسە |
| ← | لەو لێکدراوەدا بیدۆزەوە |
| ▣ | لێکدراوی ناوی |
| ⊡ | لێکدراوی فیعلی |
| ■ | ئاوەڵناوی بەرکار، چاوگی نەرێنی (مەنفی) |
| □ | لە پەنا چاوگی تێپەڕ و تێنەپەڕ، بۆ ئەو چاوگانەی سەرف کراون |

## دۆستان و مامۆستایانی یارمەتیدەرمان:

کاری فەرهەنگە فارسی ـ کوردییەکە، وەک لە پێشەکییەکەیدا باسی کراوە، بە کورتی، کارێکی هەرەوەز بوو. ڕاستە عومدەی نووسین و وەرگێران و بڕیاردان و وردەکارییەکان، هەر لە ئەستۆی ئێمە، ئەو چوار ـ پێنج کەسە بوو کە ناومان بە ناوی «ویراستار» نووسراوە؛ بەڵام لە سەرینەی زۆرێ کاری کاتگر، وەک فیش دەرهێنان لە کتێبان و ڕێک کردنیان، کە بەگەل کردمان؛ ماوەی سێ ساڵ، هەموو حەوتوویەک سێ ڕۆژ و هەموو ئەو ڕۆژانە سێ ساعەت، پازدە تا بیست کەس کۆ دەبووینەوە و یەک بە یەکی وشەکانمان دەخوێندەوە و هەرکەس هەرچێکی لە مانا و هاوواتا، پێ بوو دەیگوت و پەسند بکرایە، دەنووسرا و ...

واتا کار لە چەند قۆناغدا بەڕێوە چوو؛ لە هەر قۆناغێکیشدا کێ هاوکار بوو، ناوی نووسرا و بەم جۆرە لە چاپی دووهەمدا، ناوی پتر لە دوسەدوپەنجا کەس، کە کەم تا زۆر بەشدارییان کردبوو، بە ناوی هاوکار، باکووری گوتەنی، هاتە نڤیسین.

شێوەی کار لە سەر ئەم فەرهەنگە، وەک لە سەرەتاوە ئاماژەم پێ کرد، بە جۆرێکی تر بوو؛ زیاد لە ئێمە پێنج کەس، باقی بە ناردنی وشە و دەستەواژە و مەسەل و قسەی نەستەقی کوردی، یان ڕێنوێنی و وەرامی پرسیاران دەستیان گرتووین و یارمەتییان داوین؛ جا یەکێ زۆرتر، یەکێ کەمتر. بەو بۆنەوە بڕیارم دا لێرەدا ناوی ئەو بەڕێزانە بنووسم و بە یادێکی خێریان، سپاس و پێزانینمان دەربڕم:

دۆستان و مامۆستایان: نەمر ئەحمەدی قازی[15]، ناسر ڕەززازی،[16] ئەمین گەردیگلانی[17]، سەلاحەدین ئاشتی، موحەممەدهادی موڕادی، عەبدوڵلا سەمەدی، عەزیز فەیزنژاد؛ عەدنان بەرزەنجی، فەتاح ئەمیری، نەرمین‌کەریمیان، بیهرووز چەمەن‌ئارا، ئیحسان مەردۆخ ڕۆحانی، پدرام کەریمیان، فەریدوون کەریمیان، موحەممەد ئەمین شاسەنەم، ئەفشین بەهاری‌زەڕ، بیهزاد میرزایی، وریا دیوانی، ئەهوەن ئوستوار، بیهرووز ئەسراری، بەهائەدین ڕەحمانی(بەها)، جەلیل کەریمیان، نەریمان موحەممەدی، ئەنوەر ناسری، جەلال جەعفەری ڕەمشتی، ژیلا دهقان، حەمید نوسرەتی، کەژاڵ ساعیدی.

---

١٥. مامۆستای نەمر کاک ئەحمەدی قازی، دوای پشتیوانی و دلخۆشیدانەوە، لە ٢٦ لاپەڕەدا، زۆرێک وشەی کوردی کۆن و نوێ، هاوواتای فارسی و عەرەبی ـ کە داوامان کردبوو ـ بۆی ناردین.

١٦. کاک ناسر فەرهەنگۆکێکی بۆ ناردین کە بە چەند ساڵان گەڕان بە گوند و ناوچەکانی باکوور و باشووری کوردستاندا کۆی کردبۆوە.

١٧. کاک ئەمین فەرهەنگەکەی خۆی (ڕێژگە)ی پێش چاپ، بۆ ناردین.

# بارێکی قورس و ئەرکێکی گران

زمانی کوردی لە بنەمای هیندوو ـ ئورووپایی و بنەماڵەی هیندوو ـ ئێرانی و خێزانـەزمانی ئێرانی[18]، بۆخۆی هێندە بەربلاو بۆتەوە، کە هێندێک لە زمانناسان ـ بەپێی سێ شناسـەی جیهانی لێـک ناسـینەوەی دوو یـا چەنـد زاری یـەک زمـان لـە دوو یـان چەنـد زمـانی سەربەخۆ[19] ـ لای کەم، وەکوو سێ زمانی جیاواز چاوی لێ دەکەن و ناوی لێ دەبەن. واتـا ئەمەندە لێک دوور کەوتووینەوە، کە خەڵکی ئاسایی باکوور و باشوورمان، حەرام بێ، هـیچ لێک تێناگەن و هیچیان لە هەورامی حاڵی نابن و هەورامیش لە ئاخافتنی هیچیـان سـەر دەر ناکا!

ڕاستە بەرفراوان بوونەوەی زمان، هاوواتای دەوڵەمەند بوونەوەیە؛ بەڵام نە بەم شێوە کە ئاخێوەرانی، قسەی یەکتر فام نەکەن. لە ڕاستیدا ئەو بەرفراوان بوونەوە شتێکی تـرە و بـە ڕێبازێکی تردا تێدەپەڕێ کە زۆر لەم بارودۆخە ئێمەی تێ کـەوتوویتن جیـاوازە. ئێمـە بـە هۆی نەبوونی ناوەندێتییەکی لای کەم سیاسی، بە درێژایی مێژوومان، بڵاوەمان کـردووە و هەر خێڵێکمان ژێر سێبەرێک کەوتووین و لەو ژێرە، شتی خۆماڵـیمان لـە بـیر چۆتـەوە و شتگەلێکی نامۆمان بە مێشکدا چووە. منداڵێک لە سنە دەڵێ: «مامان بەرفەکان تراس ئاو بووگن!»، مامۆستایەک لە سلێمانی هەڵـدەدا: «... بـەس لـە ئـەرزی واقیعـدا ئـەمرێکی هاکـەزایی موسـتەحیلە!». دیسـان ئەمانـە باشـن؛ وەرە دیـاری بـاکوور! دەبـینی کـاکم خەباتگێـڕێکی زۆر ئازایـە؛ گیـانی لـە سـەر دەسـت گرتـووە و بـۆ بەرژەوەنـدی گـەل و نیشتمانەکەی، ئامادەی هەموو شتێکە؛ کەچی، کوردی نازانێ! هەر هیچ ـ هیچ!

ـ باشە ئێستا چار چییە؟

ـ بە بڕوای من، واز هێنانە لە شەڕەگەڕەکان و پەرە دانە بە زمـانی یـەکگرتوومان؛ کـە تازە خەریکە فرچک ببەستێ و وردە ـ وردە خۆ بگرێ. زۆر پێویسـتە، وەک هـەموو گـەلانی خاوەن زمانی فەرمی، زمانێکی وامان هەبێ هەموو بتوانین بیخوێنینەوە و قسەی پێ بکـەین و بۆ تێگەیشتن لە یەکتر، لە زمانی بێگانە بێنیازمان بکا. دیارە ئەوە نەک هەر دژایەتییـەکی لەگەڵ پاراستنی زار و شێوەزار و تەنانەت بـنزارەکانیشـماندا نییـە، بەڵـکوو ئـەمجار ئەوانـە هەموو دەبنە دارایی و سامانی زمانی ڕەسمیمان و لـە هـەرکوێ بـۆ وشـەیەک، زاراوەیـەک

---

١٨. عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی، پێشەکی *قامووسی زبانی کوردی*.

١٩. ئەو سێ شناسە بریتین لە:

١. دەزگای دەنگسازی؛ فارس کردوویانەتە «فضای دهانی» ؛ ٢. ڕێزمان؛ ٣. وشە

داماین، لەباتی دەست داکێشان لە نامۆیان، بە گەنجینەی نەختینــەی خۆمانـدا دەگــەڕین و کام لەبز و کێهە دەستەواژەمان پێ جوانتر بوو، ئەوە دەنووسین و دەکاری دێنین.

ئەگەر چاوێ لە دنیای عەرەب بکەین، دەبیــنین زۆرێ لــە ڕۆژهــەلاتی ناوەڕاسـت، تـا هەموو باکووری ئەفریقا ـ لە ڕۆژهەلاتییەوە تا ڕۆژاوای ـ گرتۆتەوە و سەرجەم، بیستویەک وڵاتن. هەمووش پێیان ئێژن عەرەب؛ ئەگەرچی هەر شار و باژێـڕێکی زار و زمـانی خـۆی هەیە و بە حاستەم دوو شوێنی وا بدۆزییەوە خەڵکانی وەک یەک قسـە بکـەن. زۆربـەیان زاری جلفەیان تەواو جیاوازە؛ بەلام ئەگەر هاتە سەر باسی زمانی یەکگرتوو (فُصحە)، ئـەو عالەمەیە و یەک زار، یەک ڕێزمان، یەک ڕێنووس.[20]

ئێمەش زمانەکەمان گەشە ناکا و پەرە ناسێنێ مەگەر بـەو ڕێبـازەدا بـڕۆین. هەڵـبەت دیارە جارێ لەو بەرژەوەندە وا نزیک نین و وەک گوتمان، هەر ئێستا لای کەم دوو زار بـە دوو ڕێنووسەوە هەن کە هەرکیان ناویان کوردییـە! نـاکرێ و عەقڵـیش نایبـڕێ هیچیـان بخەینە ژێر باڵی ئەویتر. بـەلام ئـەوە ئـەرکی سەرشـانی خـاوەنقەڵـەمەکانمانە کـە بـۆ ئامانجێکی وەها بکۆشن و لای کـەم، دوو نەکەنـە چـوار! ئـەمجار، بـە مـەرجێ قـەبارەی ڕێزمانیی تێک نەچێ، هێنان و دەکار کردنی وشە و تەنانەت زاراوە و دەستەواژەی هـەموو شێوەزار و بنزارەکان، دیارە سەروەت و سامانە و هێز و وزەی زمانەکەمانە و کورد گوتەنی: «نانێکە لە خوانە» و هەزار جار خوا نەیبڕێ!

لەو ناوەدا فەرهەنگنووسین، واتا کۆکردنەوە و هێنانە سەر کاغەز و ڕانانی ئەوی پێشتر گوتراوە و ئێستاش باوە و ئەوی ئێستا لە زار و زمانی خەڵک دێتە دەر و دەبێتە چەمک[21] و ئەوەش تازە بە تازە لە دایکی زمان بەدی دێ و دێتە ناو بنەماڵەکەوە، کارێکی زۆر پێویستە و وەک دەبینین هەست بە پێداویست بوونی دەگەڕێتەوە بۆ مێـژووی دەسـت بـۆ قەڵـەم بردنی ئینسان و بەدی هـاتنی خـەت و ئەوڕۆکـەش بۆتـە کۆڵـەکەی زمانـان و هـەروەها پێوانەیەک بۆ پێوانی قەوەت و قەبارەی هەر زمانێ.

دە ـ دوازدە ساڵی پێش، خوێندکارێکی زانستگای سـەلاحەدین لـە هـەولێر هاتـە لام؛ داوای فەرهەنگێکی زانستی پیشەسازی (مُهندسی) لێم دەکرد. هەروا سووک و هاسان! دەیگێڕاوە: «مامۆستاکەمان لە فەڕانسە خوێندوویە و زۆریش شارەزایە؛ بەلام ئێمە سەر لـە

---

٢٠. دیارە لێرە باسی زمـانی یـەکگرتووە؛ دەنـا لـە بـاری کۆمەڵایەتییـەوە، ئەوڕۆکـە لێـکبـڕاوتر و پرژوبلاوتر لە عەرەب، مەگەر هەر عەرەب!

٢١. هاوواتای «مفهوم»ی عەرەبی و «concept»ی ئینگلیسی.

زاره‌وه زانستییه‌کانی ـ که دیاره فه‌ڕانسییه ـ ده‌رناکه‌ین. مامۆستا ناعیلاج له کتێبێکی زانستگایی خۆی، وانه‌که‌ی ئێمه‌ی ده‌رێناوه و کردوویه‌ته نامیلکه‌یه‌ک به زمانی کوردی و هه‌موو ئه‌و وشه و زاراوه زانستییه‌شی به که‌یفی خۆی وه‌رگێڕاوه و کردوونی به کوردی! ئه‌مما چ کوردی؟ نه‌ک هه‌ر ئێمه، بۆخۆیشی سه‌ریان لێ ده‌ر ناکا و تا کتێبه فه‌ڕانسه‌که دانه‌نێ و به‌رامبه‌ریان نه‌کاته‌وه، له وه‌رگێڕاوه‌که‌ی خۆی حاڵی نابێ و نازانێ چی کردووه و چی گوتووه!»

واتا: له بیری نه‌ماوه کام وشه‌ی سه‌یروسه‌مه‌ره‌ی ده‌سکردی خۆی، له جێ کامه زاراوه‌ی زانستی فه‌ڕانسی داناوه. جا قوتابی به‌سته‌زمان وه‌ره و شت فێر ببه!

دیاره ئه‌گه‌ر له کتێبخانه‌مان فه‌رهه‌نگێکی باشی پیشه‌سازیمان ببوایه، بۆ نموونه، کاری ئه‌و مامۆستایه و خوێندکاره‌کانی چه‌ندی فه‌رق ده‌کرد و ده‌رس‌وده‌وریان چه‌نده‌ی به‌هره ده‌ببوو. به‌ڵام به‌داخه‌وه شتی وا، مه‌سه‌ل ده‌ڵێ: «به دوو پف و سه‌برێک پێک نایه» و «به ئیشه‌ڵلا و ماشه‌ڵلا سه‌ر ناگرێ». وشه تاشین و دانانی هاوواتا بۆ وشه‌ی زمانی تر، کارێکی زۆر ورد و دژواره و به کۆڕێک له زانایانی بواری زمان و وێژه و شاره‌زایانی زانسته جۆراوجۆره‌کان به‌ڕێوه ده‌چێ. ئه‌وجار ئه‌گه‌ر وشه‌یه‌ک، ده‌سته‌واژه‌یه‌ک داتاشرا و په‌سندیش کرا، تازه نیوه‌ی ڕێگایه و بۆ گشگیر بوون و چوونه نێو زمانه‌وه، ده‌وڵه‌ت و دامو‌ده‌زگایه‌کی پێویسته که ڕایگه‌یه‌نێ و سه‌ره‌نجام بیسه‌لمێنێ.

خۆ ئه‌گه‌ر سی ساڵی پێش ئاخمان هه‌ڵکێشایا و بمانگوتایا: «کوا قه‌ت ده‌ور و ده‌رفه‌تێکی وا بۆ ئێمه‌ی ژێرده‌سته‌ی ده‌ست‌به‌سته‌ی قه‌ڵه‌مشکه‌سته هه‌ڵکه‌وتووه و هه‌ڵده‌که‌وێ؟ ئێمه له کوێ و ده‌وڵه‌ت و دامو‌ده‌زگا له کوێ؟ ئه‌م قسانه هه‌موو خه‌یاڵ‌پلاون!»، ئه‌وڕۆ ده‌بێ ئاخ هه‌ڵکێشین و بێژین: «کوا به‌رهه‌مێکی به‌رچاوی ئه‌م هه‌موو ساڵه‌ی ده‌وڵه‌تی کوردی له‌م باره‌وه؟ کوا ده‌سه‌ڵات به بیریشیدا هاتووه بانگه‌وازێک بکا، زمانزانان و زمانه‌وانان کۆ کاته‌وه، ئه‌سڵی زمانه‌که بپارێزن؛ په‌ره پێ دان و فه‌رهه‌نگی زانستی دانان پێشکه‌شی خۆی!

له ته‌له‌ڤیزیۆن و مێدیاکانه‌وه هه‌ر که‌س به که‌یفی خۆی ده‌نووسێت و ده‌خوێنێته‌وه و هێندێکیان هێنده ئاوه‌کی و بێ‌سه‌روبنن، نه‌بێته‌وه. وه‌رگێڕاوه‌ی ناحه‌ز له عه‌ره‌بی و فارسی، که هیچی به سه‌ر هیچه‌وه نییه، ده‌درێته ده‌رخواردی خه‌ڵک و که‌سیش نییه پێدا بچێته‌وه و ساغێکی بکاته‌وه. بۆ نموونه ده‌ڵێ: «فلان نووسه‌ر هه‌ستا به نووسینی کتێبێکی ...»!

کاکه گیان که‌س کتێب به پاوه نانووسێ! که پێویست بکا هه‌ستێ! بۆ کتێب نووسین ده‌بێ دانیشی! ئه‌و «قام»ی عه‌ره‌بیش نه یانی «هه‌ستا سه‌ر پێ»؛ واتا: «کردی»،

«ئـەنجامی دا»، «جێبـەجێی کـرد»، «دوایـی پـێ هێنـا»، «تـەواوی کـرد»، «گەیاندییـە سەرەنجام» و ... دەنا خوا هەڵناگرێ عەرەبیش بیانـەوێ کتێـب بنووسـن، وەک هـەموو بەشەری تر، دادەنیشن!

یان ئێژێ: «فلانی کەسێکی ماندوونەناسە»!

دادە گیان ئەوەت لە کوێ هێنا؟ لە فارسـیت وەرگێڕاوەتـەوە؟ باشـە، مبارەکـە؛ بـەلام فارس «خَستگیناپَـذیر» دەڵـین، نـەک «خَستەناپَـذیر». «خَسـتە» و «مانـدوو» ئاوەڵـناو (صفت)ن. تۆ دەبێ بیکەیە «خَستگی»، «ماندوویی»، ئەوجار لێکـدراوێکی ئاوەڵـناویی لـێ دروست بکەی؛ کـە دەبێتـە «مانـدوویینـەناس»، واتـا مانـدوویی بـە لایـدا ناچـێ؛ دەنـا «ماندوونـەناس» یـانی کەسـی مانـدوو نەشـناس، هـیچ ماندوویـەک شـکنەبـەر! وەک: «خوانەناس»، «کەسنەناس» و ...

لەمانە نە یەک، نە دوو، نە دە. قەڵەم و کاغەزێک بێنە و تاقە سەعاتێک لە پـای یـەک لەو دەیان تەلەڤیزیۆنە دانیشە (نەک هەستە!) و ئەگەر تاقەتت هێنا، یەک لە دووی یـەک هەڵە ببژێرە و بنووسە! بزا سەر لە کوێوە دەردێنیێ؟

شار و باژێر پڕە لە نووسراوەی غەڵەت و پەڵەت، بە سەر جادە و دوکاناندا و کەسی پـێ داناچڵەکێ و کەسیش تەنانەت ئاوڕێکی لێ ناداتەوە!

ئەگـەر بێـژی مەنووسـن «فڕۆکەخانـەی هـەولێری نێودەوڵـەتی» بنووسـن «فڕگـەی نێونەتـەوەیی هـەولێر»، دەڵـێ: «جـا فـەرقی چییـە؟ بـۆچی بـە فڕۆکەخانـەی هـەولێر (سلێمانی)ی نێودەوڵەتیدا، فڕۆکە هەڵنافڕێ؟!».[22]

پێیبکەنی؟ بۆی بگری؟ سەر لە هەش نێی؟ فایـدەی چییـە؟ کـێ هەیـە بایـەخ بـەم قسەوباسانە بدا یان لای کەم لێی تێبگا؟ لەم بازاڕە زمـان و فەرهـەنگ ــ مامۆسـتا هـەژار گوتەنی ـ بەری چ دارێک و لەوەڕی چ هەوارێکە؟ ئاسمان بەرز و زەوی سەخت!

لێرە (ڕۆژهەلات) دیسان، بە پەرۆای هەستی نەتەوایەتی خەڵکەکەوە، هەزار نەگەویس و خوێنتاڵـیش بـین، هـەر ئەوەنـدە «زەرەرمـان بـۆ پـەز نـەبێ!»، وازمـان لـێ دێـنن بـە دەسکورتیمانەوە بساچین و کاری مێرووڵەئاسای خۆمـان بکـەین. مـەردمیش وازیـان لـە کوردی خوێندن و بە کوردی خوێندنەوە، بەزیاد بێ، کەم نییـە و ڕۆژ لـە دووی ڕۆژ، ڕووی لە زیاد بوونە. ئەگەرچی دەستەنگی خەلک لە لایەکەوە و گرانی کتێب لە لایەکی تـرەوە، پرزەی بازاڕی کتێبی بڕیوە!

---

٢٢. بە ناشکوری نەبێ، ماوەیەکە ناشفڕێ!

**با باری قسە بگۆڕم:**

پازدە ساڵی پێش[٢٣] کە لە زانستگای کوردستان دەستمان دایە کاری فەرهەنگ نووسین، ناوەندێک بە ناوی «کوردستان‌ناسی» بۆ پشتیوانی لە خاوەن‌قەڵەمی کورد و گەشە دان بە خوێندنەوە و تۆژینەوە لەمەڕ «کورد و کوردستان» بەگشتی، لە زانستگا دامەزرابوو؛ بە شوێنێکی تایبەت و کتێبخانەیەکی خنجیلانە و سەرۆک و کارگێڕەوە.

هەر ئەو ساڵانە دەنگۆیەک داکەوت کە بڕیار دراوە ڕشتەی زمان و وێژەی کوردی دامەزرێ و لە پاڵ فارسی و ئینگلیسی و عەرەبی، خوێندکار بگرێ و بە چوار ساڵ، بڕوانامەی لیسانسی کوردی پێشکەش بکا.

ساڵی ٨٢ (٢٠٠٣) قسە و باسی لیسانسی کوردی، وەکوو داخوازێک گەیشتە تاران و لەوێش بەپێی بارودۆخی ڕۆژ، پەسند کرا و جموجووڵێکی تەواوی خستە زانستگاوە و سەرۆکی ئەودەمی زانستگای کوردستان و چەند مامۆستایەکی دڵسۆز، زۆریان لە سەر کار کرد و زۆری پێوە ماندوو بوون. یەک بە یەک ناوی وانەکان بۆ ماوەی چوار ساڵ ناودێر کران و وەکوو بەرنامەیەکی کارا و ڕێکوپێک، گەیشتەوە تاران و لەوێش مۆری پەسندی پێوە نرا و تەنانەت لە لیستەی دەرس و ڕشتەکانی کونکووری ساڵی ١٣٨٤-١٣٨٣ی هەتاویدا، ناوی ڕشتەی زمان و وێژەی کوردی زانستگای کوردستان، نووسرا و بە ڕواڵەت، کار سەری گرت.

مەسەل دەڵێ: «لە ماڵی زاوا باسێک نییە، ماڵەبووک دیمبەڵەدیمباوە!» ئێمە لەم لاوە کەیفخۆش لەو دەسکەوتە، پیرۆزباییمان لێکتر دەکرد، لەو لاوە لە وەزارەتخانە، وەزیر گۆڕدرا و سیاسەتی تازە ڕاگەیندرا و دیسانەوە باسی زمانی کوردی وەپشت گوێ خرا و وەک دەڵێن: «کەفتینەوە کەڵ‌کەنوو!» خۆ دیارە بۆ کەسیش نییە بپرسێ: بۆ؟!

***

هەشت ساڵان وا تێپەڕین و کورد گوتەنی: «کەڵ بە موو بەند بوو». لەو زانستگا گەورەیەدا ژوورێک نەبوو کاری فەرهەنگەکەشمانی تێدا بکەین! و ...

ئێستا ئەمە سێ ـ چوار ساڵە، ئەو تەموومژە پڕوچڕە هێندێک ڕەویوەتەوە و شتەکە تا

---

٢٣. عەرەب دەڵێن: «قبل خمس عشره سنه». هێندێک کوردی باشوور ئەو دەستەواژەیە، وشە بە وشە وەردەگێڕنەوە و ئێژن: «پێش پازدەساڵ»! یان: «بەر لە پازدە ساڵ»! کە دیارە لەگەڵ نەحوی زمانی کوردی نایەتەوە و هەڵەیە. خۆش ئەوەیە بڕێ مامۆستای ڕۆژهەڵات کە تەنانەت عەرەبیش نازانن، عەینی شت دووپاتە دەکەنەوە؛ گوایە کوردی ڕەسەن قسە دەکەن!

ڕادەیەک ئاسایی بۆتەوە. سێ ساڵە ڕشتەی زمان و وێژەی کوردی زانستگای کوردستان خوێندکار دەگرێ و هەر ئێستا پتر لە سەد لاوی کوڕ و کچی لە خۆ گرتووە کە خەریکی خوێندنی کوردین. «ناوەندی کوردستان‌ناسی»ش پلەی تۆژینگە (پژوهشکدە)ی وەرگرتووە. واتا بووجەیەکی تایبەتی لە وەزارەتخانەوە بۆ دابین کراوە کە ئەگەرچی زۆر کەمە، بەڵام دیسان هەر باشە.

ئەمجار ئێمە؟

شاعیرێکی فارس دەڵێ: «تاو کە دەڕوا ئاوا بێ، سێبەر شۆڕتر دەبێتەوە»[٢٤] منیش کە پێم لە دەروازەی شێست ناوە و ئاوا بوونم لە بەرچاوە، تازە کەوتۆتە سەرم، پاش کاری ئەم فەرهەنگە و دەرهێنانی یەکبەرگی و چکۆلەکەی، بە یارمەتی هەواڵان و پشتیوانیی زانستگای کوردستان، لەو تۆژینگەیەدا، بناغەی فەرهەنگێکی بەرفراوان (دائرةالمعارف)ی کوردی داڕێژین و باقی ژیانم خەریکی ئەو کارە بم: (**ئاسنامەیەکی کورد و کوردستان، بریتی لە: زمان، وێژە، هونەر، مێژوو، جوغرافیا، پیشە و پیشەسازی؛ بە دەق و وێنە و فیلمەوە**). دەزانم بارێکی زۆر قورس و ئەرکێکی یەکجار گرانە و سنەیی گوتەنی: «هەر بە دەم ئاسانە». جا ئەگەر ئەو بەرگە بە بەری من و بۆ تەمەنی من «شۆڕ» بێ، هیوام بەرزە و دڵنیام لاوەکان، بە مەرجی دڵهێنان و لێبڕان، بە ئەنجامێکی شیاو و شایانی دەگەیەنن.

**وەهایە، کە کانی بە هیوا**
**بەهارانە لووزەو ئەبەستێ بە رەو شاری دەریا**

**لە هەر شوێنێ ڕاماوە، داماوە، کاری تەواوە!**
**ئەزانێ ئەبێ هەر بژێ و بازوێ**
**تا بژێ، تا بمێنێ**
**هەناوی بە هەنگاوە**
**ئەسرموتلە کوولەکەی ڕۆحی ئاوە![٢٥]**

براتان: **ماجد مەردۆخ ڕۆحانی**
پێدا چوونەوە پاییزی ١٣٩٨ (٢٠١٩)

---

٢٤ . سوی مغرب چو می‌رود خورشید سایەها را درازتر بینی «**رَهی مُعیری**»
٢٥ . کۆتایی خەوەبەردینە، «**سوارە**»

# ئـ

**ئـ** / ʼ/: پیت. هەمزە؛ یەکـەمین پـیتی ئـەلفوبێـی زمانی کوردی (*تێبینی*: ئـەم فۆنیمـە سەربەسـت نییە و وێڕای بزوێن، واتا تـەنیا لـە سـەرەتا و کۆتـایی بزوێن و بڕگـەدا هەڵـدەکەوێ، وەک: ئاسـک، ئـیش، نەء) ■ همزە؛ نخستین حرف الفبای زبان کُردی

**ئـا**[1] / a/: نـاو. *[سوورکەڵـە]* ١. ئـەرێ؛ بەڵـێ؛ وەرامـی ئەرێنی و پەسند کردن ‹هەر گوتم ئا، سواری سـەرم بوو!› ٢. ئاغە؛ ئاغا؛ کا ‹ئا حەسەن› ■ ١. آری ٢. آقا

**ئـا**[2]: ئاوەڵناو. ١. ئەو؛ هۆ؛ وێ؛ هێما پێ‌کراو ‹ئا کەلە گـەورە ئـەو دیمـش تـۆنی/ سـیاوڕیحانەکەو دەرەو لوهۆنی «فولکلۆر»› ٢. بەس؛ هەر؛ تەنیا ‹ئـا ئەمـە؛ ئا ئەوە؛ ئا ئێرە؛ ئا ئیسە› ■ ١. آن ٢. فقط؛ هم؛ نشان تأکید و تصریح

**ئـا**[3]: ئاوەڵـکار. ئائـا: ١. وەرامـی ئـەرێنی ‹پرسـیم چووی؟ گوتی ئا› ٢. چما؛ وەک بڵێی ‹ئا دیدان وە خەو دیدان «فولکلۆر»› ■ ١. آری؛ بلی ٢. انگار

**ئـا**[4]: جێناو. تۆ (بۆ مێوینە) ‹تـۆ پوڕئیحسـان و خـوەی نـەشمی/ ل دەرویشـان ئـا ب خـەشمی «مـەلای جزیری»› ■ تو (مؤنث)

**ئـا**[5]: ئامراز. ١. ئەرێ؛ بەڵێ؛ بۆ پێداگری و بە ڕاست زانین ‹ئا کاکە گیان ئەبینی چمان بە سـەر هـات!› ٢. هی ‹ئا منە› ■ ١. آری ٢. مالِ؛ مُتعلق بە

**ئـا**[6]: دەنگ. ١. بۆ ئاگـادار کردنـەوە ‹ئـا خەڵـکینە! وشیار بن!› ٢. دا؛ ئـەرێ؛ بـۆ داخـوازی ‹ئـا بێنـە بزانم!› ٣. ئەها؛ بۆ پەسند کردن ‹ئا وای لێ‌هـات› ٤. ها؛ بۆ پرسیار ‹دەگەڵ تۆم بـوو. ئـا؟› ٥. دا؛ بـۆ دنە دان ‹ئا دەی بچۆ بزانم!› ٦. دا؛ سا؛ بـە واتـای «مەکە» ‹ئا دەنگ!› ■ ١. هـان ٢. لطفـاً ٣. آری ۴. بلی ۵. حرف تشجیع ۶ دِ

**ئـا ـ**[7]: پێشـگر. ١. ڤەـ؛ ئەوەـ ‹ئاکـەردش› ٢. بڵـند؛ درێژ ‹ئاموور› ٣. گەورە؛ مەزن ‹ئادا› ٤. نیشانەی پرس ‹ئاخۆ› ■ ١. باز ـ ٢. بُلند ٣. بزرگ ۴. آیا

**ئائـا**[1] / a'a/: ☜ **ئا**[3]

**ئائـا**[2]: دەنگ. ١. بۆ سەرسووڕمان ‹ئائا لەو خەڵکە!› ٢. بە گاڵتە دەگوترێ و جێگای «نا» دەگرێتـەوە ‹تۆش پوولت دا بە کاک سمایل؟ ئائا دامێ! من چۆن پوولی مفت دەدەم؟!› ■ ١. حرف تعجُب ٢. چرا

**ئائلی** / a'lî/: ناو. زۆربێژی؛ ملهوڕی ■ زورگویی

**ئـائۆرت** / a'ort/: ناو. سوورە دەماری هەرەگەورەی لەشی بڕبڕەداران ■ آئورت

**ئائۆش** / a'oş/: ئاوەلکار. هێشتا؛ تا ئێستا ■ تاکنون

**ئائەمانە** / a'emane/: جێناو. ئامانە؛ ناینە ■ همین‌ها

**ئائەمە** / a'eme/: جێناو. (بـەس/ هـەر) ئـەم یەکـە ‹ئائەمە هەڵگرە!› ■ همین یکی

**ئائـەوە** / a'ewe/: جێـناو. (بـەس/ هـەر) ئـەو یەکـە ‹ئائەوە داگرە!› ■ همان یکی

**ئائیسه** / a'îse/: ☜ ئائێستا

**ئائێره** / a'êre/: جێناو. هەر ئێره؛ ئەڤێرێ؛ ئائێگره؛ ئایره؛ ئالێگره ⚑ همین جا

**ئائێستا** / a'êsta/: ئاوەڵکار. ئائیسه؛ ئێستاکه؛ ئەئێستا؛ هەنووکه ⚑ هم‌اکنون

**ئائێسته** / a'êste/: ئاوەڵکار. وێستا؛ وێستان؛ وێسه ⚑ همین اکنون

**ئائێگره** / a'êgre/: ☜ ئائێره

**ئاب** / ab/: ناو. ١. ☜ ئاو ٢. ☜ ئاگوست

**ئابات**[١] / abat/: ☜ ئاوا[١]ـ١

**. ئابات**[٢]: پاشەوشه. ئاوەدان‌کەرەوه؛ ئاوان‌کەرەوه ⚑ ـاباد

**ئاباجی** / abacî/: ناو. ١. ئابجی؛ خوشکی گەوره ٢. پوور؛ میمک ⚑ ١. خواهر بزرگ ٢. عمّه

**ئابادی** / abadî/: ☜ ئاوەدانی

**ئابجۆ** / abco/: ☜ ئاوجۆ

**ئابجوو** / abcû/: ☜ ئاوجۆ

**ئابجی** / abcî/: ناو. ئاباجی؛ خوشکی‌گەوره ⚑ آبجی

**ئابخانه** / abxane/: ناو.[کینایه] ئاودەست؛ دەستاو؛ سەراو؛ سەرپێشاو ⚑ مُستراح

**ئابدار** / abdar/: ☜ ئاودارچی

**ئابدارباشی** / abdarbaşî/: ☜ ئاودارچی

**ئابدارخانه** / abdarxane/: ناو. ئاودارخانه: ١. کونەڵان؛ ژووری قاوه لێنان و چا ساز کردن ٢. بار و بنەی تایبەتی پیاوماقوولان له سەفەر ⚑ ١. آبدارخانه ٢. بار و بنديل سفر اشراف

**ئابدۆزەک** / abdozek/: ناو. ئاودزەک؛ ئاودوزەک: ١. شرینقه؛ فیچقه؛ فیشقه؛ سورەنگ؛ له ئامێرەکانی وەشاندنی دەرمان له لەش ٢. قەتاره؛ قەترەکێش؛ لوولەشووشەی دەم‌تەنگ که تنۆکه دەرمانی پێ دە شتێ دەکەن ⚑ ١. سُرنگ ٢. قطره‌چکان

**ئابدەست** / abdest/: ☜ ئاودەست

**ئابدەستخانه** / abdestxane/: ☜ ئاودەست

**ئابرا** / ab(i)ra/: ناو. برادەر؛ براله؛ برا؛ ئابا؛ کاکۆ؛ کاکه؛ کاک: ١. براڵه (ئابرا، هۆشت بێ!) ٢. لاوژا؛ داش؛ کاکەبرا؛ ئاغەبرا (زۆرتر بۆ برای گەوره) (ئابرام کرێکاری ئەوێیه) ⚑ ١و٢. داداش

**ئابڕوو** / abřû/: ناو. ئاوڕوو؛ ئاڤاڕوو؛ ئاڤڕوو؛ هاوڕوو؛ نەتا: ١. سکەوسیرەت؛ شەرت؛ ستر؛ چەتاو؛ کردەوەی گونجاو لەگەڵ بایەخگەلی کۆمەڵگادا (سەگ نایخوا، وەک پلێک گۆشتی بێ‌تاوان/ تا ئابڕووی ئەم عەسرەی پێ بەرێ ئینسان! «گۆران») ٢. بارودۆخێ که هۆی سەربەرزی و خۆشناوییه (خوێن ڕژا، ڕۆڵه کوژا، کەلله پژا/ خوێن‌ڕژان خۆشه که ئابڕوو نەڕژا «هەژار، *بۆ کوردستان*») ⚑ ١و٢. آبرو

⊡ **ئابڕوو بردن**: ئابڕوو بۆ نەهێشتن؛ ئابڕوو تکاندن؛ ناو زڕاندن؛ بێ ئابڕوو کردن؛ سووکایەتی به سەر کەسێکدا هێنان (شەرتی دڵداری هەتا مردنه/ دەس له یەک بەردان، ئابڕوو بردنه «فولکلۆر») ⚑ رسوا کردن

**ئابڕوو بۆ نەهێشتن**: ☜ ئابڕوو بردن

**ئابڕوو تکان**: ☜ ئابڕوو چوون

**ئابڕوو تکاندن**: ☜ ئابڕوو بردن

**ئابڕوو چوون**: ئابڕوو تکان؛ ئابڕوو نەمان؛ ناو زڕان؛ بێ ئابڕوو بوون ⚑ رسوا شدن

**ئابڕوو نەمان**: ☜ ئابڕوو چوون

**ئابڕووی کەسێ بردن**: ئاوڕووی کەسێ بردن/ تکاندن؛ ناوی کەسێ زڕاندن؛ شەقڵ کەسێ شکاندن؛ سووکایەتی به سەر کەسێ هێنان ⚑ آبروی کسی را بردن

**ئابڕووی کەسێ بردنه سەر لقی دار**: *[مەجاز]* زڕاندنی نهێنی کەسێک و ئابڕوو بردنی ⚑ راز کسی را فاش کردن

**ئابڕووی کەسێ کڕینەوه/ سەندنەوه**: بەرگری کردن له بەدنامی و ناو زڕانی کەسێک ⚑ آبروی کسی را خریدن

**ئابڕووبراو / abřûb(i)raw/**: ئاوەڵناو. هەتكیایش؛ ئابڕوونەماو ☰ رسوا؛ هتک حُرمت شده

**ئابڕووبەر / abřûber/**: ☞ **ئاوڕووبەرە**

**ئابڕووبەرە / abřûbere/**: ☞ **ئاوڕووبەرە**

**ئابڕووتکاو / abřût(i)kaw/**: ئاوەڵناو. ڕووسیا؛ بێئاوڕوو؛ سووک و چرووک ☰ بیآبرو

**ئابڕووتکاوی / abřût(i)kawî/**: ناو. فەزیحەت؛ بێئابڕوویی؛ ناوزڕاوی ☰ رسوایی

**ئابڕوودار / abřûdar/**: ئاوەڵناو. بەشەرەف؛ ئابڕوومەند؛ ئاوڕوومەند ☰ آبرومند

**ئابڕووداری / abřûdarî/**: ناو. ئاوڕووداری؛ ئابڕوومەندی: ١. ژیانی شەرافەتمەندانە و بە سەربەرزی ٢. *[کینایە]* بەرگری لە ئابڕوو چوون؛ دۆخی لای بێگانە نەدرکاندنی هەندێ نهێنی کە بۆی هەیە ببێتە هۆی سەرشۆڕی ٣. *[کینایە]* کار یا دۆخی بە زللە ڕوومەت سوور ڕاگرتن ☰ ١تا٣. آبروداری

**ئابڕووڕژاو / abřûř(i)jaw/**: ئاوەڵناو. هەتكی؛ هەتک کراو ☰ بیآبرو

**ئابڕوومەند / abřûmend/**: ☞ **ئابڕوودار**

**ئابڕوومەندی / abřûmendî/**: ☞ **ئابڕووداری**

**ئابلۆقە / abloqe/**: ☞ **ئابڵۆقە**

**ئابڵۆقە / abłoqe/**: ناو. ئابلۆقە؛ ئابڵووقە؛ گەمارۆ؛ چاکمە؛ ئاخڵە؛ هەتیتە؛ حاتە؛ کارەڕەهاتی دەورە دان و نەهێشتنی دابڕانی پێوەندی شوێنێک لەگەڵ دەور و بەری ‹قەلا ئابڵۆقە دراوە› ☰ مُحاصره

⊡ **ئابڵۆقە دان**: دەورە دان؛ گەمارۆ دان ☰ محاصره کردن

**ئابڵۆقە دران**: دەورە دران؛ گەمارۆ دران ☰ محاصره شدن

**ئابڵووقە / abłûqe/**: ☞ **ئابڵۆقە**

**ئابنوس[1] / abnûs/**: ناو. ئەبەنووس؛ عەبەنووس؛ حەپەنووس؛ ئاوەنووس؛ ئەبانووس؛ دار ئەبنووس؛ دارێکی ڕەش و ڕەقی بەنرخە، بۆ نازک‌کاری بەکار دێ ☰ آبنوس

**ئابنوس[2]**: ئاوەڵناو. ئاوەنووس؛ ئەبەنووس؛ ئاوەنووس؛ ئەبانووس؛ لە جنسی ئابنووس ‹بونیانی کیبر و سەرکەشییە تاقی کیسرەوی/ دانانی زوڵم و ڕووڕەشییە تەختی ئابنووس «نالی»› ☰ آبنوس

**ئابوتاب / ab û tab/**: ناو. تامولام؛ ئاووتاو ‹زۆر بە ئابوتاب قسەکەی گێڕاوە› ☰ آبوتاب

**ئابۆنە / abone/**: ئاوەڵناو. تەژە؛ زلحۆرت (بۆ پیاو) ☰ لندهور

**ئابور[1] / abûr/**: ☞ **ئابوری**

**ئابور[2]**: ئاوەڵناو. ساز؛ تەیار؛ ڕێک‌وپێک؛ ئامادە ☰ آماده؛ مُهیا

⊡ **ئابور کرن**: ساز دان؛ پێک‌هێنان؛ ئامادە کردن ‹مە کارا خۆ ئابوور کر› ☰ فراهم/ مُهیا کردن

**ئابوری / abûrî/**: ناو. ئابوور: ١. کاری بەڕێوە بردنی ژێرانەی خەرج و داهات ٢. کۆمەڵە بابەتی سەبارەت بە پێوەندی خەرج و داهات ٣. زانستی ئابووری؛ زانستی لێکۆڵینەوە لە شێوەی ژیانی تاک و کۆمەڵگا و پێوەندی نێوان ئەم شێوە ژیانە و قانوونی زاڵ بە سەریاندا و هەروەها دۆزینەوە و پێشنیار کردنی شێوە یان شێوەگەلی تازە بۆ بەرهەم هێنان و دابەش کردنی داهات ☰ ١تا٣. اقتصاد

**ئابوریزان / abûrîzan/**: ناو. ئابووریناس؛ پسپۆڕی زانستی ئابووری ☰ اقتصاددان

**ئابوریناس / abûrînas/**: ☞ **ئابوریزان**

**ئابونمان / abûnman/**: ناو. مزی سالانە یان مانگانە بۆ بەشداربوان ☰ آبونمان

**ئابونە / abûne/**: ئاوەڵناو. بەشدار؛ هاوبەش لە شتێ ☰ آبونه

**ئابەوهت / abewhit/**: ناو. ئاوات؛ هیوا؛ ئارەزوو ☰ آرزو

**ئابی** / abî/: ☜ **ئاوی**

**ئابیده** / abîde/: ناو. ١. پەیکەر؛ کوتەڵ؛ هەیکەل ٢. کۆشک؛ بینای گەورە ≡ ١. مُجسمه؛ تندیس ٢. کاخ؛ قصر

**ئابێز** / abêz/: ناو. جۆرێ کایەی منداڵانە وەک شەشخانە، کە خانەکەی بازنەییە ≡ از بازی‌های کودکانه

**ئاپ** / ap/: ☜ **ئاپۆ**

**ئاپا** / apa/: ناو. پوور؛ میمک؛ خوشکی ئاپۆ ≡ عمّه

**ئاپارات** / aparat/: ناو. ١. ئامرازی نواندنی فیلمی سینەمایی ٢. ئامرازی پەنچەرگیری چەرخی ماشێن ≡ ١و٢. آپارات

**ئاپارتاید** / apartayd/: ناو. *[رامیاری]* ڕەگەزپەرستی؛ سیاسەتی دووچاوەکی و جیاوازیی ڕەگەزی، دژی ڕەش و ڕەنگین پێستان ≡ آپارتاید

**ئاپارتمان** / apart(i)man/: ناو. وارخان؛ شوقە ≡ آپارتمان

**ئاپاندیس** / apandîs/: ناو. بنەڕیخۆڵە؛ ڕیخۆڵەکوێرە؛ زیادەڕیخۆڵە ≡ آپاندیس

**ئاپاندیسیت** / apandîsît/: ناو. دۆخی هەو کردنی ئاپاندیس کە وێڕای ژانەزگ، لیک ڕژاندن و یاو سەر هەڵدەدا ≡ آپاندیسیت

**ئاپتەر** / apter/: ئاوەڵناو. شێت؛ لێوە؛ دێوانە ≡ دیوانه

**ئاپراخ** / aprax/: ☜ **یاپراخ**

**ئاپریل** / aprîl/: ☜ **ئاوریل**

**ئاپریڵ** / aprîł/: ☜ **ئاوریل**

**ئاپنجی** / apincî/: ناو. جۆرێ عەبای قەدیمی ≡ نوعی قبای قدیمی

**ئاپور** / apur/: ناو. بەڵا؛ ئاشیت ≡ آفت

**ئاپۆ** / apo/: ناو. ئاپ؛ هاپ؛ هاپۆ؛ مام؛ مامە؛ مامۆ ≡ عمو

**ئاپۆر**[1] / apor/: ناو. بەڵا؛ تەگەرە و تووشی؛ بەسەرهاتی خراپ ≡ بلا؛ مُصیبت

**ئاپۆر**[2]: ئاوەڵناو. بیانی؛ بێگانە ≡ بیگانه

**ئاپۆرا** / apora/: ☜ **ئاپۆرە ـ٢**

**ئاپۆرە** / apore/: ناو. ١. بەڵا؛ ئاپۆر ٢. ئاپۆرا؛ جمە؛ گوڕمۆڕە؛ گورتل؛ کۆمای خەڵک پێکەوە ‹لە دوورەوە چاوم لە ئاپۆرەی دەور قەبرەکە بوو کە بە خەمەوە دەگریان› ≡ ١. بلا؛ مُصیبت ٢. ازدحام؛ شلوغی

⊡ **ئاپۆرە دان:** کۆمرە دان؛ کەڵەکە کردن؛ قووڕ بەسان؛ لە شوێنێک گلێر بوونەوە، لێک ترنجان و هەرا و هوریا کردن ‹خەڵکێکی زۆر لە دەوری مزگەوت ئاپۆرەیان داوە› ≡ ازدحام کردن

**ئاپۆرەحاڵ** / aporeḧał/: ئاوەڵناو. بەستەزمان؛ فەقیرحاڵ ≡ زبان‌بسته

**ئاپۆژن** / apojin/: ناو. مامۆژن ≡ زن‌عمو

**ئاپوورە** / apûre/: ناو. قەوتە؛ حەشامات؛ کۆمەڵی زۆر لە مەردم ≡ تودەی مردم

**ئاتاج** / atac/: ئاوەڵناو. ئاتاژ؛ هەژار؛ نەدار؛ چاو لە کۆمەک ≡ مُحتاج؛ نیازمند

**ئاتاجی** / atacî/: ناو. ١. هەژاری؛ نەداری ٢. پێداویستی ≡ ١. فقر ٢. نیاز

**ئاتاژ** / ataj/: ☜ **ئاتاج**

**ئاتاف** / ataf/: ناو. بەڵا؛ چۆرتم ≡ بلا

**ئاتر** / atir/: ☜ **ئاگر**

**ئاترەش** / atreş/: ناو. ئاگادار و زێڕەوانی ئاور لە ئایینی زەردەشتدا ≡ نگهبان آتش در آیین زرتشت

**ئاتڵ** / atił/: ئاوەڵناو. ناڕەوا؛ ناحەق ≡ ناروا

**ئاتڵای** / atłay/: ناو. مۆڵەت؛ دەرفەت ≡ مُهلت

**ئاتماجە** / atmace/: ناو. ئاتمەجە؛ هەڵۆ ≡ عُقاب

**ئاتمەجە** / atmece/: ☜ **ئاتماجە**

**ئاتوون** / atûn/: ناو. ١. ئاتەشخان؛ قەیتوون؛ دۆزەقە؛ دۆزەخە؛ توونخانەی حەمام؛ تووونی گەرماو ٢. قاتوقڕی ≡ ١. آتشدان حمام ٢. قحطی

**ئاتەر** / ater/: ☜ **ئاگر**

**ئاتەران** / ateran/: ☜ **هاتەران**

**ئاتەران . پاتەران** / ateran pateran/: ☜ **هاتەران ـ پاتەران**

**ئاتەشبازی** / ateşbazî/: ناو. ئاگربازی؛ ئەیرەکلێ؛ گرگران؛ کاری تەقە کردن و فیشەکەشێتە هەڵدان لە جێژن و خۆشیدا ‹ئاتەشبازی بە قنگی خالی ناکرێ! «مەسەل»› ☰ آتش‌بازی

**ئاتەشپارە** / ateşpare/: ناوەڵناو. ١. هار و هاج؛ هار و هەردە ٢. [کنایە] زرینگ؛ زرت و زیندوو؛ ئازا و وریا ☰ ١و٢. آتشپارە

**ئاتەشخان** / ateşxan/: ناو. ١. ☜ **ئاتوون ـ١** ٢. قووڵکەی ژێر تیانە کە ئاگری تێدا دەکەنەوە ‹گۆشەی ئاتەشخان دڵەی پڕ جە ئێش/ پزیسکەی داخان ئایر وەردا لێش «مەولەوی»› ☰ ١. ☜ **ئاتوون ـ١** ٢. اجاق سنگی

**ئاتەشخانە** / ateşxane/: ناو. ئاگردان؛ پەنگردانی سەماوەری چای ساز کردن ☰ آتشدان سماور

**ئاتەشکەدە** / ateşkede/: ☜ **ئاورخانە ـ٢**

**ئاتەشگا** / ateşga/: ☜ **ئاورخانە ـ٢**

**ئاتەشە** / ateşe/: ناو. ١. ئاورە؛ زەردەبرین ٢. ئاتەشەک؛ سووزاک ☰ ١. زردە زخم ٢. سوزاک

**ئاتەشەک** / ateşek/: ☜ **ئاتەشە ـ٢**

**ئاتەشی** / ateşî/: ناوەڵناو. ١. ئاتەشین؛ ئاگری؛ بە ڕەنگی سووری ڕۆشن ٢. [مەجاز] گرگین؛ تووڕە؛ جنگز ☰ ١. رنگ آتشی ٢. آتشی‌مزاج

**ئاتەشین** / ateşîn/: ☜ **ئاتەشی ـ١**

**ئاتەک** / atek/: ☜ **ئاتەگ**

**ئاتەگ** / ateg/: ناو. ئاتەک: ١. شاقەڵ؛ داوێنی کەوای شۆڕ ‹نوێژ لە سەر ئاتەگی دەکرێ «مەسەل»› ٢. بنار؛ پێدەشت؛ پاڵداوێن ٣. داوێنی زین کە دەکەوێتە ژێر ڕانی سوار ٤. گۆشتی پەراسووی حەیوانی سەربڕاو ☰ ١. دامن قبای بلند ٢. دامنەی کوە ٣. برگ زین ٤. گوشت دندە

**ئاتی** / atî/: ناو. زێڕ؛ ئاڵتوون؛ تەلا ☰ طلا

**ئاتیوان** / atîwan/: چاوگ. توانەوە؛ تاویانەوە ☰ ذوب شدن

**ئاتیواندن** / atîwandin/: ☜ **ئاتیوانن**

**ئاتیوانن** / atîwanin/: چاوگ. ئاتیواندن؛ تاواندنەوە؛ تواندنەوە؛ ئاواندن ☰ ذوب کردن

**ئاتێل** / atêl/: ناو. تەختەبەند؛ ئامرازی تایبەت بۆ شکستەبەنی ☰ آتِل

**ئاج** / ac/: ☜ **عاج ـ٢**

**ئاجاخ** / acax/: ناوەڵناو. خویا؛ دیار؛ دیاردی؛ ئاشکرا ☰ آشکار

**ئاجار** / acar/: ☜ **ئاجاڕ**

**ئاجاڕ** / acař/: ناو. ئاجار؛ پنجاڕ؛ ڕەگ و بنی گیا ☰ رگ و ریشەی گیاه

**ئاجر** / acir/: ناو. ئادزا؛ جۆرێ مووروی تەزبێح ☰ نوعی مُهرەی تسبیح

**ئاجگی** / ac(i)gî/: ناوەڵناو. ئاجەک؛ چکووس؛ ڕژد؛ ڕژ؛ دەستقووچاو ☰ خسیس

**ئاجور** / acur/: ☜ **ئاجۆر**

**ئاجۆ** / aco/: ناوەڵناو. ڕەق؛ سەخت ☰ سخت

**ئاجۆر** / acor/: ناو. ئاجور؛ ئاجوور؛ کەرپووچ؛ کارپووچ؛ کەرپیچ؛ کارپیچ؛ کەلپیک؛ کولپیک؛ خشت بوشیای؛ خشتی لم و ڕەڵمی سوورەوەکراو ☰ آجُر

**ئاجۆرپەز** / acorpez/: ناو. کەسێ کە خشت سوور دەکاتەوە و دەیکاتە ئاجۆر ☰ آجُرپز

**ئاجۆرپێژ** / acorpêj/: ناو. خشتبڕ بۆ ئاجۆر ☰ خشت‌زن

**ئاجۆری** / acorî/: ناو. ١. دروستکراو لە ئاجۆر ٢. بە ڕەنگی قاوەیی ئاماڵ سوور ☰ ١و٢. آجُری

**ئاجوج** / acûc/: لێل. ← **ئاجوج و ماجوج**

**ئاجوج و ماجوج** / acûc û macûc/: ناو. [باوەری

کۆن/ لە تەورات و دەقە ئیسلامییەکاندا بەو هۆز و خێڵانە گوتراوە کە لە سپای شەیتاندا بوون و بەشێکیان لە باکووری قەفقازدا دەژیان، پاشایەکی دووشاخ (زولقەرنەین) دیوارێکی بەردینی لە پێشدا هەڵچنین، پێش بە هێرشیان بگرێ ≡ یأجوج و مأجوج

**ئاجوور** / acûr/: ☜ ئاجۆر

**ئاجەک** / acek/: ئاوەڵناو. ئاجگی؛ چکووس؛ ڕژد ≡ خسیس

**ئاجی** / acî/: ناو. دادە؛ باجی ≡ آبجی

**ئاجیل** / acîl/: ناو. چەرەس؛ چەرەز؛ شەوچەرە؛ خواردەمەنی تێکەڵ بە وشکباری گەرمشتە ≡ آجیل

**ئاچار** / açar/: ☜ هاچەر

**ئاچخ** / açix/: ئاوەڵناو. ئاچوخ؛ کاڵ؛ بە ڕەنگی کاڵ ‹پارچەی کەواکەم شینی ئاچخە› ≡ روشن

**ئاچم** / açim/: دەنگ. هاچم؛ هەتشم؛ دەنگی پژمە ≡ صدای عطسه

**ئاچوخ** / açux/: ئاوەڵناو. ١. ☜ ئاچخ ٢. کراوە؛ باز؛ ئاوەڵا ≡ ١. ☜ ئاچخ ٢. باز

**ئاچەر** / açer/: ☜ هاچەر

**ئاچەرفەڕانسە**/ açerfeřanse/: ☜ هاچەرفەڕانسە

**ئاچی** / açî/: ئاوەڵکار. بۆ؛ بۆچی؛ بۆچە ≡ چرا

**ئاحیل** / aĥîl/: ئاوەڵناو. کاڵ؛ کامڵ؛ بە تەمەنی نێوان جحێڵی و پیری (٥٥-٤٠) ≡ میانسال

**ئاحێلی** / aĥêlî/: ناو. کالی؛ کامڵی؛ تەمەنی نێوان جحێڵی و پیری ≡ میانسالی

**ئاخ**[1] / ax/: ناو. ١. خاک؛ خۆڵ ‹هەرچێکی لە ناخی ئاخ و دەریان/ هی چۆتە بناو ئەوی لە سەریان «هەژار، مەم و زین»› ٢. هەناسەی بەرز و پڕخەفەت ‹یارێکم ناوێ کە هەر داخی بێ/ ڕاڕا و مۆن و پەست دایم ئاخی بێ «فولکلۆر»› ٣. زێد؛ وڵات ≡ ١. خاک ٢. آه ٣. سرزمین

▣ **ئاخ هەڵکێشان**: لە خەمان ئاخ و داخ گوتن و هەناسە دان ‹ماڵ لە مەریوان، دڵ لە دەروێشان/ مردن خۆشترە لە ئاخ هەڵکێشان «فولکلۆر»› ≡ آه حسرت سر دادن

**ئاخ**[2]: سارتە. ١. وشەی دەربڕینی ناڕەزایەتی ‹ئاخ لەم ڕۆژگارە تێ کەوتین!› ٢. وشەی دەربڕینی ئازار ‹ئاخ، دەستم سووتا!› ٣. وشەی دەربڕینی حەسرەت ‹چەن چکۆلەن پەلەوەر لەو بەرزە/ ئاخ کە چەند خوێڕیگرە ئەو عەرزە! «سوارە»› ٤. وشەی دەربڕینی خەفەت ‹ئاخ، چۆن بەو ئاواتەوە سەری ناوە!› ٥. خۆزگە؛ خوەزیا؛ بریا ‹ئاخ، هێندە نەدەمردم کوردستانم بە ڕزگاری دەدیت› ≡ ١تا٤. آخ ٥. کاش

**ئاخا** / axa/: ☜ ئاغا

**ئاخافتن** / axaftin/: چاوگ. ئاخاوتن؛ ئاخوفتن؛ ئاخۆتن؛ ئاخەفتن؛ پەیڤین؛ گوتن؛ قسە کردن ≡ سخن گفتن

**ئاخاندن** / axandin/: چاوگ. ئاخنین؛ تەپاندن؛ پڕ کردن ≡ آکندن

**ئاخاوتن** / axawtin/: ☜ ئاخافتن

**ئاخایۆک**[1] / axayok/: ناو. جۆرێ سەقر ≡ نوعی باز

**ئاخایۆک**[2]: ئاوەڵناو. خۆبەزلزان ≡ خودبزرگ‌بین

**ئاخباران** / axbaran/: ناو. تۆزباران؛ تەپ و تۆز؛ کەش داگرتنی تۆز و خۆڵ ≡ بارش گرد و غُبار

**ئاخبان** / axban/: ناو. گڵەبان؛ ئاخەبان؛ بانەناو ≡ گل‌اندود بام

**ئاختف** / axtif/: ناو. بەڵغەم؛ تفلیک ≡ بلغم

**ئاخچەباش** / axçebaş/: ناو. ئاخچەواش؛ ئاغەجەواش؛ ئاغچەواش؛ ئاغچەباش؛ پیتۆکە؛ گیایەکی یەکساڵەیە لە بنەماڵەی هەلامە و مەندێ، کە لاسک و گەڵاکانی تووکنە و بە جوانی بە مەبەستی گیابرژیوە و گیای ناو دۆکولیو بەکاری دێنن ≡ جعفری فرنگی کُرکدار

**ئاخچەواش** / axçewaş/: ☜ **ئاخچەباش**

**ئاخدار** / axdar/: ئاوەڵناو. خەمبار؛ خەفەتبار ☰ غمگین

**ئاخر**[1] / axir/: ناو. ١. ئاکام؛ ئەنجام؛ سەرئەنجام ‹بێدایکم و بێبابم، بێمام و برا ماوم/ لەم ئاخری عومرەمدا، وا دیارە کە تاقانەم «ئاوات»› ٢. کۆتایی؛ دوایی ‹ئاخری کار› ☰ ١. آخر؛ سرانجام ٢. پایان

**ئاخر**[2]: ئاوەڵناو. ئاخری؛ لە دوا کەوتوو ‹کاری ئاخر› ☰ آخری

**ئاخر**[3]: ئاوەڵکار. ئاخری؛ ئاخرسەر؛ دوایی؛ عاقیبەت ‹ئاخر گەرمیان سارێش کەرد زامەت/ بی وە هامدەمت تا ڕۆی قیامەت «مەولەوی»› ☰ عاقبت؛ سرانجام

**ئاخر**[4]: ئامراز. ١. مەگەر ‹خانەقا و شێخ و تەکیەکان یەکسەر/ پێم بڵێن نەفعیان چییە ئاخر؟ «حاجی قادر»› ٢. دەسا؛ ئیتر ‹ئاخر کوا ئەوە بوو بە کار؟› ☰ ١. مگر ٢. آخر

**ئاخرچاک** / axirçak/: ئاوەڵناو. عاقیبەت بە خەیر ☰ نیک‌فرجام

**ئاخرخێر** / axirxêr/: ئاوەڵناو. عاقیبەت بە خەیر؛ پیری چاک و پیرۆز. بەرانبەر: **ئاخرشەڕ** ☰ نیک‌فرجام

**ئاخرزەمان** / axirzeman/: ناو. دنیائاخری؛ کاتی دوایی هاتنی جیهان و ژیانی سەر زەوی ‹چاو ئەگەر فرمێسکی خوێنین دانەڕێژێ بۆ وڵات/ دەک بە کوێری هەر بمێنی تاوەکوو ئاخرزەمان «قانع»› ☰ آخرزمان

**ئاخرسەر** / axirser/: ☜ **ئاخر**[3]

**ئاخرشەڕ** / axirşeř/: ئاوەڵناو. پیری بەدفەڕ و نەگریس ‹پیری ئاخرشەڕ وەتەنت فرۆشت/ ئابڕووت گۆڕییەوە بە پلاو و گۆشت؟! «هەژار، *بۆ کوردستان*»›. بەرانبەر: **ئاخرخێر** ☰ بدفرجام

**ئاخرکە** / axirke/: ناو. ئاخرگە؛ ئاخویرک؛ ئاخۆرە؛ مێشوولەی زۆر ورد ☰ پشەی خاکی

**ئاخرگە** / axirge/: ☜ **ئاخرکە**

**ئاخر و ئۆخر** / axir û 'oxir/: ئاوەڵکار. نێزیک بە برانەوە ‹لە ئاخر و ئۆخری پاییزدا باری کرد و هاتە شار› ☰ اواخر

**ئاخرەت** / ax(i)ret/: ناو. سڵا؛ سەڵا؛ پەسڵان؛ قیامەت؛ ڕۆژی هەستانەوەی پاش مردن ☰ آخرت

**ئاخرەمین** / ax(i)remîn/: ئاوەڵناو. دوامین؛ ئاخرین؛ ئاخری ‹ئەوە ئاخرەمین جار بێ پێت بڵێم، ئیتر پێت ناڵێمەوە!› ☰ واپسین

**ئاخرهیچ** / axirhîç/: ئاوەڵناو. ١. بێئاکام؛ دەس لە پووش ٢. بێفایە؛ بێکەڵک ☰ ١. ناکام ٢. بی‌فایده

**ئاخری**[1] / ax(i)rî/: ئاوەڵناو. ئاخرەمین ☰ واپسین

**ئاخری**[2]: ئاوەڵکار. دوایی؛ کۆتایی ‹ئاخری ملی دا و هات› ☰ سرانجام

**ئاخرین** / ax(i)rîn/: ☜ **ئاخرەمین**

**ئاخڕەنگ** / axřeng/: ناو. سپیچۆلک؛ ڕەنگی خاک ☰ رنگ خاکی

**ئاخزوونە** / axzûne/: ☜ **ئاغزوونە**

**ئاخسبات** / axs(i)bat/: ☜ **ئاخلەوەڕ**

**ئاخش** / axiş/: دەنگ. ئۆخەی؛ ئاخەیش ☰ آخش

**ئاخفتن** / axiftin/: ☜ **ئاخفین**

**ئاخفین** / ax(i)fîn/: چاوگ. ١. دەم دانەوەی خونچەی گوڵ ٢. پەیڤین؛ قسە کردن ☰ ١. باز شدن غنچه ٢. سخن گفتن

**ئاخڤاندن** / axvandin/: چاوگ. ١. هێنانە قسە؛ وە قسە خستن ٢. کولاندنەوە؛ ئازار دان (زام) ☰ ١. به حرف آوردن ٢. ریش کردن (زخم)

**ئاخڤین** / axvîn/: چاوگ. ئاخفتن: ١. هاتنە قسە؛ زار کردنەوە ٢. کولانەوە؛ ئازار دیتن (زام) ☰ ١. به حرف آمدن ٢. ریش شدن (زخم)

**ئاخکۆلک** / axkolik/: ناو. کۆختە؛ کۆلیت ☰ کُلبه

**ئاخگە** / axge/: ناو. ئاویلکە؛ گیانەلاو ☰ دم مرگ

**ئاخلەوەڕ** / axleweř/: ناو. ئاخسبات؛ ئاخنەبا؛ ئاخنەبات؛ نیوەی ئاخری ڕەشەمە، کاتی سەر دەرهێنانی گیا و لەوەڕ لە ژێر خاک ☰ نیمەی آخر اسفند

**ئاخلەویک** / axlewîk/: ☜ **ئاغڵەویك**

**ئاخلیڤینک** / axlîvînk/: ☜ **ئاغڵەویك**

**ئاخلێفە** / axlêfe/: ☜ **ئاخلێڤە**

**ئاخلێڤ** / axlêv/: ☜ **ئاخلێڤە**

**ئاخلێڤە** / axlêve/: ناو. ئاخلێفە؛ ئاخلێڤ؛ سەرەتای بەهار کە شینکە بە حاڵ سەری دەرهێناوە ☰ سرآغاز بهار

**ئاخڵ**[1] / axił/: ناو. ١. ☜ **ئاخڵە ـ١** ٢. هۆڵ؛ جێی داکردنی مەڕ و مالات ‹کە ڕانەکەتان کردە ناو ئاخڵ/ منیش چووم لەوێ بووم بە یاساوڵ «فولکلۆر»› ☰ ١. ☜ **ئاخڵە ـ١** ٢. آغُل

**ئاخڵ**[2]: ئاوەڵناو. خاپوور؛ ورد و وێران ☰ ویران

**ئاخڵە** / axłe/: ناو. ١. ئاخڵ؛ خەرمانە (مانگ) ‹ئاخڵە لە دەوری مانگ دیارە› ٢. پەپکە؛ پاپۆکەی مار ‹مارەکە ئاخڵەی دابوو› ٣. کادێن؛ کادان؛ جێگەی کۆ کردنەوە و ڕاگرتنی خۆراکی چوارپێیان ٤. قەلاغەتەپاڵە ٥. قەیران؛ ئەوپەڕی کارەسات ☰ ١. هاله (ماه) ٢. چنبره ٣. کاهدان ۴. دیوار تاپاله ۵. بُحران

⊡ **ئاخڵە دان**: ١. پەپکە دان؛ پاپۆکە خواردن ٢. کۆز بەستن و کۆ بوونەوە بە دەوری شتێکدا ☰ ١. چنبره زدن ٢. حلقه زدن دور چیزی

**ئاخڵەویک** / axłewîk/: ☜ **ئاغڵەویك**

**ئاخڵەوێک** / axłewêk/: ☜ **ئاغڵەویك**

**ئاخڵێف** / axłêf/: ناو. فڕ؛ بافیش و درۆ و دەلەسە ☰ فریب

**ـ ئاخن** / axin-/: پاشەوشە. پەستاوتە ‹نێوئاخن› ☰ ـ آکند

**ئاخنان** / ax(i)nan/: ☜ **ئاخنین**

**ئاخناو** / axnaw/: ☜ **ئاخندراو**

**ئاخندران** / axind(i)ran/: ☜ **ئاخنران**

**ئاخندراو** / axind(i)raw/: ئاوەڵناو. ئاخناو؛ ئاخنراو؛ تێپەستراو؛ پەستواو ☰ آکنده

**ئاخنران** / axinran/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //ئاخنرای؛ دەئاخنرێی؛ بئاخنرێ// ئاخندران؛ خنران؛ تێپەستران ‹لە پیاوی ئازا و سەرکەش/ لە زەحمەتکێشی بێبەش/ ئاخنراوە کونەڕەش/ نابینی کەسێ ڕووگەش «هێمن»› ☰ آکنده شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ئاخنراو/ چاوگی نەرێنی: نەئاخنران

**ئاخنراو** / axinraw/: ☜ **ئاخندراو**

**ئاخنەبا** / axneba/: ☜ **ئاخلەوەڕ**

**ئاخنەبات** / axnebat/: ☜ **ئاخلەوەڕ**

**ئاخنین** / ax(i)nîn/: چاوگ. تێپەڕ. //ئاخنیت؛ دەئاخنی؛ بئاخنە// ئاخنان؛ تێپەستاوتن؛ بە زۆر تێڕا کردن ‹کێ زۆر چنۆک و پیسە بە ڕژدی بیبەزێنە!/ زێڕ باخنە قولینچکان، وەک مشکی سەر خەزێنە «هەژار، *شەرەفنامە*»› ☰ آکندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەئاخنین

**ئاخنینەوە** / ax(i)nînewe/: چاوگ. وەئاخنین؛ تێپەستاوتن ‹خەریکی ئاخنینەوەی پێستە پەنیرانم؛ لە بەیانییەوە دوو پێستەم ئاخنیوەتەوە› ☰ آکندن

**ئاخو** / axw/: ناو. ژەهر؛ زەهر ☰ زهر

**ئاخ و ئۆف** / ax û 'of/: ☜ **ئۆف و ئاخ**

**ئاخوا** / axwa/: ☜ **ئاخۆ**

**ئاخوداخ** / ax û dax/: ناو. ١. سۆ؛ ئەفسۆس؛ عەزرەت؛ داخ و کەسەر بۆ شتێ کە نییە ‹بۆ وەتەن، بێشەی شێرانم، حەسرەتا سەد ئاخوداخ!/ بۆ ڕەواجی کوردەکانم، حەسرەتا سەد ئاخوداخ «قانع»› ٢. ئاه و نالە؛ نکوناڵ؛ نزوولە؛ گریان و هاوار بە

هۆی ئێش یان خەفەتەوە ‹ئاواتی بۆچی نایەتە دی پیرەهۆنەرێک؟ هەر ئاخوداخییە لە بەیانی هەتا شەوێ «ئاوات»› ■ ١. آه و افسوس ٢. آه و ناله

**ئاخوڕ** / axuř/: ناو. ئاڵفدان؛ ئاخۆڕ؛ ئافر؛ شوێنی هەڵبەستراو بۆ جێی خۆراکی ئاژەڵ ■ آخور

**ئاخوڕاو** / axuřaw/: ناو. قووم؛ حەوزی درێژاودرێژی هەڵبەستراو بۆ ئاو خواردنەوەی مالات ■ آبشخور

**ئاخوڕبەرز** / axuřberz/: ئاوەڵناو. [پلار] فرەخواز؛ زیادەخۆر ■ زیادەطلب

**ئاخوڕچەور** / axuřçewr/: ئاوەڵناو. [پلار] پڕ و پۆشتە؛ پۆشتە و پەرداخ؛ تێر و تەسەل؛ ساماندار و خۆشبژیو ■ مُرفه

**ئاخوڕچی** / axuřçî/: ناو. مەیتەر ■ مهتر

**ئاخوفتن** / axuftin/: ☜ **ئاخافتن**

**ئاخون** / axun/: ناو. ١. ☜ **ئاخوند** ٢. نینۆک؛ ناخوون ■ ١. ☜ **ئاخوند** ٢. ناخُن

**ئاخوند** / axund/: ناو. ئاخون؛ یاخون؛ مەلای عەجەمان ■ آخوند

**ئاخوەوەند** / axwewend/: ناو. پاڵەمێر؛ زیرەک؛ وریا ■ زیرک

**ئاخوێرک** / axwîrik/: ☜ **ئاخرکە**

**ئاخوین** / ax(i)wîn/: چاوگ. گۆشتەزوون هێنانەوە؛ زار هاتنە یەکی وەک چاک بوونەوەی برین ■ التیام یافتن

**ئاخۆ** / axo/: ئاوەڵکار. ئاخوا؛ داخۆ؛ ئایا؛ ئایاکوو ‹سەری هەر دوو کوڵمی ئاخۆ، گوڵی نەوبەهارە یاخۆ/ تەرەفی نەهارە زولفی، زُلَفٌ مِنَ اللَّیالی «نالی»› ■ آیا

**ئاخۆتن** / axotin/: ☜ **ئاخافتن**

**ئاخۆران** / axoran/: لێل. ← **ئاخۆران باخۆران**

**ئاخۆران باخۆران** / axoran baxoran/: ناو. ١. بشێوە؛ بشێوی و ئاژاوە ‹ئاخۆران باخۆرانێکە سەگ خاوەنی خۆی ناناسێ› ٢. کۆمەڵی دز و تالانچی ‹ئای لەو ئاخۆران باخۆرانە، خۆ هیچیان پێ نەهێشتین!› ■ ١. هرج و مرج ٢. حرامیان

**ئاخۆرە** / axore/: ☜ **ئاخرکە**

**ئاخۆڕ** / axoř/: ☜ **ئاخوڕ**

**ئاخەبان** / axeban/: ناو. ئاخبان: ١. گڵەبان؛ بانەناو ٢. بانی بانەناو کراوی لێکولووس ‹کیژ هەر کیژی دوو گوندانە/ جێگای خۆشیان ئاخەبانە «مەسەل»› ٣. هاووڵاتی ■ ١. گِل‌اندود بام ٢. بامِ خوب گل‌اندود شده ٣. هم‌ولایتی

**ئاخەبانو** / axebanû/: ناو. جامانە؛ ئاغابانوو؛ تەنراوێکی سپی و ڕەش یان سوور و سپی کە پیاوان لە سەری دەبەستن ■ نوعی دستار مردانه

**ئاخەڕەش** / axeřeş/: ناو. ژیلەمۆ؛ بووڵ؛ خۆڵی ڕەش ■ خاکستر

**ئاخەفتن** / axeftin/: ☜ **ئاخافتن**

**ئاخەفتەر** / axefter/: ناو. وێژەر؛ بێژەر؛ قسەکەر ■ گوینده

**ئاخەفتیار** / axeftyar/: ناو. دەمڕاست؛ کەسێ کە لە لایەن کەسانێکەوە قسە دەکات ■ سخنگو

**ئاخەلێوە** / axelêwe/: ناو. ئاخلیڤە؛ خاکەلێوە؛ کاتی تازە شین بوونی دەشت؛ سەرەتای بەهار ■ اوایل بهار

**ئاخەنای** / axenay/: چاوگ. ئاخنین؛ تەپاندن ■ آکندن

**ئاخەنیای** / axenyay/: چاوگ. ئاخنران ■ آکنده شدن

**ئاخەیش** / axeyş/: ☜ **ئاخش**

**ئاخی** / axî/: ئاوەڵناو. یاخی؛ یاغی؛ سەرکێش؛ پێ‌چەقێن ■ یاغی

**ئاخین** / axîn/: چاوگ. ئاخ هەڵکێشان ■ آه سر دادن

**ئاخیۆل** / axyol/: ناو. ١. کاری قوڕ شێلان بۆ هەوڕ ٢. خۆڵەپۆتێ؛ یاری بە خۆڵ ٣. قوڕەبان؛

بانەناو ۱. عمل گل را برای سفالگری و بنایی عمل آوردن ۲. خاکبازی ۳. گل‌اندود بام

**ئاخیە** / ax(i)ye/: ناو. گولمێخ؛ سنگی ئاسنی ئالقەدار یا سنگی ئەستووری دارین میخ آخور

**ئاخێز** / axêz/: ناو. ۱. کار و ڕەوتی نیوە هەڵسان ‹ـ چوویە ماڵی مام پیرۆت، لە بەرت هەستا؟ ـ بە خوا نە تەواو، هەروا ئاخێزێکی کرد› ۲. کار و ڕەوتی هەستان بە تەواوی ‹هەر تا نە جای وێم کەردەنم ئاخێز/ سەر مەبۆ وە نرخ ڕێزەی گەلاڕێز «خانای قوبادی»› * هەروەها: **ئاخێز کردن** ۱. نیمخیز ۲. قیام

**ئاخێزان** / axêzan/: چاوگ. ئاخێزیان؛ ئاخێزانەوە: ۱. لە خۆ نەوین بۆ هەستانەوە ۲. ڕاپەڕین؛ لەپڕ هەستان ۱. برخاستن ۲. ورجهیدن

**ئاخێزانەوە** / axêzanewe/: ☜ **ئاخێزان**

**ئاخێزگە** / axêzge/: ناو. سەرچاوە؛ شوێنێ کە کار یان ڕەوتێ لەوێوە دەست پێدەکا خاستگاه

**ئاخێزیان** / axêzyan/: ☜ **ئاخێزان**

**ئاخێفتن** / axêftin/: چاوگ. ڕواندن؛ دەرهێنان رویاندن

**ئاخێوتن** / axêwtin/: چاوگ. ئاژۆتن؛ لێخوڕین راندن

**ئاخێوەر** / axêwer/: ناو. دەمڕاست؛ قسەبێژ سخنگو

**ئاد**[1] / ad/: ناو. ئاداگ؛ دوڕگە؛ جزیرە؛ وشکانی لە ناو ئاودا جزیره

**ئاد**[2]: جێناو. وی؛ ئەو (بۆ نێر) او (مذکر)

**ئادا** / ada/: ناو. ۱. دلاوایی؛ دەس‌ودڵبازی ۲. پسپۆڕی؛ لێزانی ۱. سخاوت ۲. مهارت

**ئاداب** / adab/: ناو. ڕێ‌وشوێن؛ داب‌ونەریت؛ هۆرتەوبەرە آداب

**ئادابزان** / adabzan/: ناوەڵناو. ئاگا لە داب‌ونەریتی کۆمەڵگا. هەروەها: **ئاداب‌نەزان** آداب‌دان

**ئاداپتور** / adaptor/: ناو. ئامرازی گۆڕینەوەی ڤۆلتاژی کارەبا آداپتور

**ئادار** / adar/: ناو. ۱. ئازار؛ مارس؛ مانگی ڕۆمی کە ۳۱ ڕۆژە، لە بیستی ڕەشەمەوە دەست پێ دەکا و تا دەی خاکەلێوە درێژەی هەیە ۲. شۆ؛ شوێن؛ شوێنەوار ۱. مارس ۲. رد؛ اثر

⊡ **ئادار بە سەر یادارەوە نەمان**: وێران بوون؛ ژێر و ژوور بوون؛ خاپوور بوون ویران شدن

**ئادار بە سەر یادارەوە نەهێشتن**: نابووت و وێران کردن ‹نایەڵن ئادار بە سەر یاداری ئەو دەربارەوە/ چونکە دەیگوت نایەڵم ئاداری کورد، یاداری کورد «هێمن»› نیست و نابود کردن

**ئادارۆک** / adarok/: ناو. ۱. گوڵێکی جوانی کوێستانییە کە لە وەرزی گوڵاندا دەڕوێت گوڵەکانی سوور، ئاڵ، سپی و مۆری مەیلەو سووری هەیە و گەڵاکانی گڕن‌ـگڕنیی و باریکە ۲. جەژنی ساڵی نوێ؛ نەورۆزی دابی کۆن ۱. شقایق نُعمانی ۲. نوروز در روایات کهن

**ئاداگ** / adag/: ☜ **ئاد**[1]

**ئادان** / adan/: ناوەڵناو. نەخت؛ بە پیت و بەرەکەت (زەوی) حاصلخیز

**ئادر** / adir/: ☜ **ئاگر**

**ئادرەس** / adres/: ناو. ناونیشان؛ نیشان؛ نوون؛ شوون‌ونوون؛ ناونیشانی جێگایەک نشانی

**ئادزا** / adza/: ☜ **ئاجر**

**ئادگار** / adgar/: ناو. ۱. ئەدگار؛ ڕوخسار؛ بیچم؛ دەم و چاو ۲. بەژن؛ باڵا؛ قەڵافەت ۱. چهره؛ سیما ۲. قد و قامت

**ئادۆ** / ado/: ناو. خۆشی؛ کەیف؛ شادی شادی

**ئادۆدە** / adode/: ☜ **ئادوودە**

**ئادوودە** / adûde/: ناو. ئادۆدە: ۱. قامیش یان داری درێژ کە ماڵی پێ پاک دەکەنەوە ۲. نێرەژەن؛ داری بەینی دوو لوولەپ لە مەشکەدا ۳.

بژارچن ▤ ١. گردگیر ٢. چوب بین دو دستەی مشک ٣. وجین‌کار

**ئادە**[1] / ade/: ناو. ١. بژار؛ کاری خاوێن کردنەوەی مەزرا لە گژوگیای خۆڕسکی بێ‌کەڵک ٢. تەڵە؛ جۆرێک داوی دارین ٣. ئاد؛ دوورگە؛ جزیرە ▤ ١. وجین ٢. نوعی تله ٣. جزیره

**ئادە**[2]: جێناو. ڤێ؛ ئەو (بۆ مێ) ▤ او (مؤنث)

**ئادەر** / ader/: ئاوەڵناو. ڕەسەن؛ جسن؛ کەحێل (ئەسپ) ▤ اصیل؛ نجیب (اسب)

**ئادەم** / adem/: ناو. ١. بابەدەم؛ مێردی دایکەوا؛ هەوەڵین باپیری مرۆ ٢. بنیادەم؛ مرۆڤ؛ ئینسان ▤ ١. آدم بوالبشر ٢. انسان

**ئادەمی** / ademî/: ناو. مرۆ؛ مرۆڤ؛ بەشەر ▤ آدمی

**ئادەمیزا** / ademîza/: ☜ ئادەمیزاد

**ئادەمیزاد** / ademîzad/: ناو. مرۆ؛ ئادەم؛ بنیادەم؛ ئادەمیزا ▤ آدمیزاد

**ئادەی** / adey/: دەنگ. هادەی؛ وشەی دنە دان ▤ کلمەی تشجیع

**ئادی** / adî/: جێناو. ئەویتر؛ ئەویکە ▤ دیگری

**ئادیدانک** / adîdanik/: ناو. تەپلەک؛ ژێرجگەرە ▤ زیرسیگاری

**ئادیشا** / adîşa/: جێناو. ئەوان ‹ئادیشا ڤاتەبێ نەلی چنیشا› ▤ ایشان؛ آنها

**ئادینده** / adînde/: ناو. کۆلکەزێرینە ▤ رنگین‌کمان

**ئادێ** / adê/: جێناو. ئەوان ‹ئادێ چێیش مارا؟› ▤ آنها

**ئادێنە** / adêne/: ناو. ئالفجار؛ جاڕی پڕ گژ و گیا ▤ مزرعەی پُرعلف

**ئار** / ar/: ناو. ١. ئارد؛ دەغڵی هاڕدراوی ئامادەی نان ٢. ☜ ئاگر ٣. دوو تاڵی نێوەڕاستی تەون ٤. گرێی ناوەڕاستی تەون ▤ ١. آرد ٢. ☜ ئاگر ٣. دو تار وسط دارقالی ٤. دو گره وسط دارقالی

**ئارا**[1] / ara/: ناو. ١. دۆستی؛ نێوانخۆشی ٢. نێوان؛ لە ناو ‹چەمەن چۆڵ بوو، لە ئارادا نەما گوڵ، شین نەکەم چی بکەم؟/ لیباسی ئیرسی مەجنوونیی بە بەر خۆما نەکەم چی بکەم؟ «فیکری کوردستانی»› ٣. جێگەی ژینی هەمیشەیی ‹چ دلکێشە ئیلاهی سەبزەیی نەوڕەستەیی کوڵمی/ لە دەوری بەرگی گوڵ شیرینە ئارا خەتی ژەنگاری «وەفایی»› ▤ ١. دوستی ٢. میان ٣. محل ثابت زندگی

• **ئارا**[2]: پاشگر. ـ ڕازێن؛ ـ خەمێڵن ‹ئەگەر دڵبەر دڵ‌ئارا بێ چ خۆشە!/ بەزەوق و ئاڵووالا بێ چ خۆشە! «هاوات»› ▤ ـ آرا

**ئاراس** / aras/: ناو. ئەسرین؛ فرمێسک؛ فرمیسک ▤ اشک

**ئاراستن** / arastin/: چاوگ. ١. خستنە پشت گوێ ٢. خەملاندن؛ ڕازاندنەوە ▤ ١. پشت گوشت انداختن ٢. آراستن

**ئاراستە** / araste/: ناو. ئاراسە: ١. پێشکەش؛ پێشکێش ‹ئەم گوڵەتان ئاراستە دەکەم› ٢. لا؛ سۆ؛ بەر ‹دوای کوڕەکە هەر کەس بە ئاراستەیەکدا چوو› ٣. حەواڵە؛ کاری ناردن ‹جوێنێکی ئاراستەی تایفەکەیان کرد› ▤ ١. تقدیم ٢. سو ٣. حواله

⊡ **ئاراستە کردن**: ١. پێشکەش کردن ٢. بۆ ناردن ٣. بەرەو کەس یان شتێ کردن ‹تیرێکی ئاراستە کرد؛ تۆمەتێکی ئاراستە کردم› ▤ ١. تقدیم کردن ٢. فرستادن ٣. متوجه کردن

**ئاراسە** / arase/: ☜ ئاراستە[1]

**ئاراڤ** / arav/: ناو. ١. شیو و کول؛ سابوون یان ئەسپۆن و ئاوی حازرکراو بۆ جل شتن ٢. نیر و ئاموور ▤ ١. لوازم رختشویی ٢. خیش

**ئاراک** / arak/: ناو. ئاورگە؛ ئاتەشگا ▤ آتشکده

**ئاراگێڵ** / aragêl/: ئاوەڵناو. ئاوارە؛ هەڵوەدا ▤ دربەدر

**ئارام**[1] / aram/: ناو. ئۆقرە؛ هەدا؛ هارام؛ قەرار؛

سەقام ‹چاوی مەخمووری کە هەڵبێنێ بە ناز/ دڵ لە لای نامێنێ ئارام و قەرار «حەریق»› 🇮🇷 آرامش

⊡ **ئارام گرتن**: ئۆقرە گرتن؛ هەدا دان 🇮🇷 آرامش یافتن

**ئارام لێبران/ بڕین**: ئارام لێ‌هەڵگیران/ هەڵگرتن 🇮🇷 بیقرار شدن/ کردن

**ئارام لێهەڵگیران** ☜ **ئارام لێبران/ بڕین**

**ئارام**[2]: ناوەڵناو. هارام؛ هێدی؛ هێمن؛ مەند؛ ئۆقرەگرتوو؛ بێجووڵە 🇮🇷 آرام

⊡ **ئارام بوون/ بوونەوە** هێمن بوون/ بوونەوە؛ هێور بوون/ بوونەوە: ١. نەمانی شڵەژاوی ‹ولات ئارام بووەوە› ٢. سرەوان؛ دامرکان؛ سوکنایی هاتن؛ نەمانی ژان و ئێش ‹ژانە سەرەکەم ئارام بوو› ٣. بێ‌دەنگ بوون ‹شەقامەکان ئارام بوون، تەنانەت دەنگی ترپەی پێش نەدەهات›. هەروەها: **ئارام کردن** 🇮🇷 ١. آرامش یافتن ٢. آرام شدن ٣. ساکت شدن

**ئارام**[3]: ناوەڵکار. هێواش؛ بە ئارامی؛ بە ئەسپایی: ١. بێ‌پەلە ‹ئارام برۆ! پەلەی چیتە؟› ٢. بە نەرمی؛ بێ‌تەوژم و پاڵی زۆر ‹یەک دەیشێلام ئارام ئارام/ یەک قانەقدیلەی دەدام «هێمن»› ٣. بە دەنگی نزم ‹ئارام قسە بکە! میوانەکان خەوتوون› 🇮🇷 ١تا٣. آرام

**ئارامگێڵ** / aramgêl/: ناوەڵناو. خۆشبەز؛ خۆش‌ڕکێف (ئەسپ) 🇮🇷 بادپا (اسب)

**ئارامی** / aramî/: ناو. ١. هێوری؛ هێمنی؛ بار و دۆخی هێمن بوون ٢. هێواشی؛ مەندی؛ لەسەرخۆیی ٣. کپوکپی؛ بێ‌دەنگی ٤. لە زمانگەلی سامی باکووری ڕۆژاوی ئاسیا کە لە نێوان ٣٠٠ ساڵ پێش لە دایک بوونی عیساوە تا ٦٥٠ی زایینی، لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا باو بووە 🇮🇷 ١تا۴. آرامی

**ئاران**[1] / aran/: چاوگ. تێنەپەڕ. //ئارای؛ دەئارێی؛ بئارێ// ١. ڕەنجیان؛ دڵ ئێشان ٢. هاڕدران؛ هاڕیان؛ ورد بوون 🇮🇷 ١. آزرده شدن ٢. خرد شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ئاراو/ چاوگی نەرێنی: نەئاران

**ئاران**[2]: ناو. ١. گەرمەسێر؛ گەرمیان؛ بنکەی ژیانی زستانەی کۆچەران ‹هەموو چوونە هەواران، ئێمە ماوین لە ئاران «مەسەل»› ٢. ساکەدەشت؛ شوێنی بەرین و بەربڵاو ٣. عەزیەت و ئێش ٤. هان؛ دنە 🇮🇷 ١. قشلاق ٢. دشت وسیع ٣. آزار ۴. تحریک

**ئاراندن** / arandin/: چاوگ. ١. ئێشاندن؛ عەزیەت دان ٢. هاڕین؛ ورد کردن ٣. کولاندنەوە ٤. هان دان؛ دنە دان 🇮🇷 ١. آزُردن ٢. خُرد کردن ٣. ریش کردن ۴. تحریک کردن

**ئارانشین** / aran(i)şîn/: ناو. هۆلس؛ نیشتەجێ؛ دژی کۆچەر 🇮🇷 یکجانشین

**ئارانی** / aranî/: ناو. هەرمەنی 🇮🇷 ارمنی

**ئاراو**[1] / araw/: ناو. کەفاوی جارێک بۆ جل شتن دە کارکراوی هێشتا بە کەڵکماو 🇮🇷 پساب رختشویی

**ئاراو**[2]: ئاوەڵناو. ڕەنجاو؛ گەهراو 🇮🇷 آزُرده

**ئاراوقارا** / arawqara/: ناو. ئۆقرە و ئارام ‹ئارا و قارای لێ هەڵگیراوە› 🇮🇷 آرام و قرار

**ئارایش** / arayiş/: ناو. ئارایشت؛ خەمڵ؛ جوانکاری؛ ڕەوش؛ کار و ڕەوتی ڕازاندنەوە ‹چێشەن ئارایش سەر تا وە دامان/ مەر خاڵۆم وە عەزم سەیرتان ئامان «مەولەوی»› 🇮🇷 آرایش

**ئارایشت** / arayişt/: ☜ **ئارایش**

**ئارایشگا** / arayişga/: ناو. سەرتاشخانە؛ دووکانی سەرتاشین یان کورت و ڕێک کردنی مووی سەر 🇮🇷 آرایشگاه

**ئارترۆز** / art(i)roz/: ناو. نەخۆشی پووکانەوەی جمگەی لەش و سەرهەڵدانی ژان و ئێش تێیاندا 🇮🇷 آرتروز

**ئارتوون** / artûn/: ناو. ١. ئاگردان؛ ئاورگ؛ توون ٢. دۆژە؛ دۆزەخ؛ جەهەننەم 🇮🇷 ١. تون حمام ٢.

دوزخ

**ئارتیست** / artîst/: ناو. نیارڤان؛ کۆسەکار؛ شانۆکار ☰ آرتیست

**ئارتین** / artîn/: ناو. بڵێسە؛ بڵێزە ☰ زبانەی آتش

**ئارج** / arc/: ناو. دارحەیزەران کە دەکرێتە گۆچان و دیرەگە خێوەت ☰ چوب خیزران

**ئارچەن** / arçen/: ☜ **ئەرزینگ**

**ئارخاڤک** / arxavik/: ناو. ١. پەلوولـە؛ چێشتی ئارد و ڕۆن ٢. کولێرەی بە شەکر و ئارد ☰ ١. کاچی ٢. نوعی گردەنان

**ئارختک** / arixtik/: ناو. ئارختە؛ مۆتەکە؛ شەوە؛ دیمەن یان بوونەوەری بە هەیبەت و خۆفناک کە بە هۆی ترسی زۆر یان نەخۆشییەوە دێتە بەرچاو ☰ کابوس

**ئارختە** / arixte/: ☜ **ئارختك**

**ئارخەیان** / arxeyan/: ئاوەڵناو. دڵنیا؛ خاترجەم؛ بێخەم؛ بێترس و دوودلی ☰ مُطمئن

**ئارخەیانی** / arxeyanî/: ناو. دڵنیایی؛ خەیاڵڕاحەتی ☰ اطمینان

**ئارد** / ard/: ناو. ئار؛ هارد؛ هەڕد؛ هەرد: ١. دەغڵی هاڕدراوی ئامادەی کردنە هەویر بۆ نان ‹ئاردی گەنم› ٢. هەر شتێ کە هاڕدرابێ ‹ئاردی سرینچک› ☰ ١و٢. آرد

▣ **ئاردی نێو درك:** */کینایە/* ئاردی نێو دروو؛ شتێ کە دەس‌خستنی یان کارێ کە کردنی زۆر دژوارە ‹ئەو زەمانی بوونە ئاردی نێو درک/ پارەیەک ناکا دوو سەد جار بێتە ڕک «حاجی قادر»› ☰ کاری کە انجامش یا چیزی کە دسترسی بدان بسیار دشوار است

**ئاردی نێو درو:** ☜ **ئاردی نێو درك**

▣ **ئارد بێژان:** ئارد لە هێڵەک دان ‹ئارد بێژان و گیان کێشان «مەسەل»› ☰ آرد را الک کردن

**ئارد تەقاندن:** ئارد لە هێڵەک دان و سۆسی ڕژاندن ☰ آرد را الک کردن

**ئارد کردن:** هاڕین؛ ڤەهاڕین؛ گژمراندن؛ کردنە ئارد ☰ آرد کردن

**ئارداڤ** / ardav/: ئاوەڵناو. فێڵباز؛ گزیکار؛ گزەوون ☰ حیلەگر

**ئاردال** / ardał/: ناو. مێرگ؛ چیمەن؛ چینک ☰ مرغزار

**ئارداوی** / ardawî/: ئاوەڵناو. هارداوی: ١. بە ئاردەوە تلاو ٢. */مەجاز/* تێوەگلاو؛ دەرگیر؛ تێکەڵاو ☰ ١. آردی؛ آردآلود ٢. آلودە؛ آغشتە

**ئارداوێژ** / ardawêj/: ناو. ١. ئاردەشان؛ بەردۆڵیان؛ شوێنی دەرچوونی ئارد لە بەرداش ٢. لێوارە بەرداش لە گەڕاندا کە ئارد دەهاوێژێتە ناو قوولکەوە ٣. */کینایە/* دەراوی دەمی وێژەر ‹فلانی ئارداوێژی خۆشە!› ☰ ١. محل بیرون زدن آرد از سنگ آسیا ٢. لبەی آسیا سنگ ٣. لحن گوینده

**ئاردبێژ** / ardbêj/: ناو. ئاردوێژ: ١. هێڵەک ٢. ئارد لە هێڵەک‌دەر ☰ ١. الک ٢. الک‌زن

**ئاردپێچ** / ardpêç/: ناو. جۆرێ هەڵوای لە ئارد و شەکر ☰ نوعی حلوا

**ئاردڤێر** / ardvêr/: ناو. هێڵەک ☰ الک

**ئاردکێش** / ardkêş/: ناو. بێڵۆکەی دارینی ئاشەوان کە ئاردی پێ لە قوولکە دەردەدا ☰ پاروی آردکش آسیابان

**ئاردگن** / ardgin/: ☜ ئاردمگن

**ئاردماڵک** / ardmałik/: ناو. ئەو کۆنە پەڕۆیە ئاشەوان جێ ئاردی پێ دەماڵێ ‹بە شانم تا بلێی باری گرانە/ پەڕۆی ئاردماڵکی لای ئاشەوانە «قانع»› ☰ کهنەی پاک کردن تە ماندەی آرد در آسیاب

**ئاردن** / ardin/: چاوگ. هاوردن؛ هێنان؛ ئانین ☰ آوردن

**ئارد و ڕۆن** / ard û řon/: ناو. میوانی؛ قەیماخ؛ چێشتی هێندێک تەڕی ئارد و ڕۆن کە زۆرتر بۆ

زەیستان دروست دەکرێ ☰ کاچی

**ئاردوێژ** / ardwêj/: ☜ ئاردبێژ

**ئـاردوو** / ardû/: نـاو. ١. سـووتمان؛ دۆخـی ئاگرکەوتنەوە ٢. ئاوردوو؛ سووتەمەنی ☰ ١. حریق ٢. سوخت

**ئاردە**[1] / arde/: ☜ ئەردە

**ئـاردە**[2]: ئاوەڵناو. نۆهاتی؛ تازەداهاتوو؛ تازەبابەت ☰ تازه مُد شده

**ئاردەبارە** / ardebare/: ناو. ئاردەوارە؛ بەشە ئاردێک کە خاوەن ئارد بۆ هەر بارێک بە خۆشی خۆی بە ئاشەوانی دەبەخشێ ☰ بخشش آرد به آسیابان

**ئـاردەبرنج** / ardeb(i)rinc/: ناو. برنجی هاڕدراو ☰ آرد برنج

**ئاردەبڕوێش** / ardebiřwêş/: ☜ ئارزان

**ئاردەتوو** / ardetû/: ناو. تووی شیرینی هـاڕدراو و تۆپەڵ‌کراو ☰ آرد توت

**ئاردەساوار** / ardesawar/: ناو. پیرخەنیلە؛ وردەساوار ☰ بلغور آسیاب‌شده

**ئاردەشان** / ardeşan/: ☜ ئارداوێژ ـ١

**ئاردەشیرە** / ardeşîre/: ناو. ئاردەقوم؛ هەڵـواتاردە؛ تێکەڵاوی ئەردە و دۆشاوی ترێ ☰ اردەشیره

**ئاردەشێلە** / ardeşêle/: ناو. گـیراوەی چەسـپنی ئارد و ئاو بۆ چەسپەمەنی و درز گـرتن ☰ چسب آرد و آب

**ئـاردەگن** / ardegin/: ناو. ئـاردگن؛ سـرینچک ☰ سنجد

**ئـاردەڵ** / ardeł/: نـاو. بـابنۆکـەر؛ بـابنۆگـە؛ ڕاوێژکەری خان؛ نۆکەری بەردەستی خانی گـەورە ☰ آردل

**ئاردەڵۆک** / ardełok/: ☜ ئاردەڵووکە ـ١

**ئاردەڵووکـە** / ardełûke/: نـاو. ١. ئاردەڵـۆک؛ ئاردەڵێن؛ وردە ئاردی سەر لێوی قوولکە لە ئاشدا ٢. *[مەجاز]* بەفری زۆر ورد و وشـک ☰ ١. گـرد آرد در آسیا ٢. برف ریز و خشک

**ئاردەڵێن** / ardełên/: ناو. ١. ☜ ئاردەڵووکە ـ١ ٢. ئاردبێژ؛ هێڵەک ☰ ١. ☜ ئاردەڵووکە ـ١ ٢. الک

**ئاردەماڵ** / ardemał/: ناو. بێڵـی ئـارد ماڵـین لـە ئاشدا ☰ آردروب

**ئاردەمشار** / ardem(i)şar/: نـاو. بڕەمشـار؛ وردە و پردەی چێوی هەڕە کراو ☰ خاک‌ارّه

**ئـاردەوا** / ardewa/: ناو. ئاردی؛ پەڵووڵە؛ چێشـتی گزمووڵە هەویر و کووزەڵە ☰ نوعی آش از خمیر و ترتیزک

**ئاردەوارە** / ardeware/: ☜ ئاردەبارە

**ئاردەی** / ardey/: چاوگ. هێنان؛ هاوردن؛ هـانین؛ ئانین ☰ آوردن

**ئاردەینە** / ardeyne/: چاوگ. داهێنان؛ داهـاوردن ☰ اختراع کردن

**ئاردهەڕ** / ardheř/: ناو. ئاشەوان ☰ آسیابان

**ئاردی**[1] / ardî/: ☜ ئاردەوا

**ئاردی**[2]: ئاوەڵناو. ئارداوی؛ هارداوی ☰ آردی

**ئاردێز** / ardêz/: ناو. ئاردبێژ؛ ئێلەک؛ هێڵـەک ☰ الک

**ئارزاڵە** / arzałe/: ☜ ئازاڵە

**ئـارزان** / arzan/: ناو. ئاردەبڕوێش؛ ئاردی ساوار ☰ آرد بلغور

**ئارزن** / arzin/: ☜ ئەرزینگ

**ئارزە** / arze/: جێناو. ئـازە؛ ئـەو (بـۆ مێوینـە) ☰ او (مؤنث)

**ئارزەن** / arzen/: ☜ ئەرزینگ

**ئـارزی** / arzî/: ناو. ١. ☜ ئـارەزوو ٢. دەسمایـە؛ سەرمایە ☰ ١. ☜ ئارەزوو ٢. سرمایه

**ئارزینج** / arzînç/: ناو. ئـارووک؛ ئاریـک؛ مـیچ ☰ سقف

**ئارزینگ** / arzîng/: ☜ ئەرزینگ

**ئارزێ** / arzê/: جێناو. ئازێ؛ ئەوان ☰ آنها

**ئارژنگ** / arjing/: ناو. ئارژەنگ؛ ئارژنگی؛ ئاژنگ؛ هەرژنگ؛ چلداسە؛ هەرجن؛ چوالەگوریانە؛ شفسک؛ دارچکێکە لە بنەماڵەی بادام و تەنگس، قەدی لاسکەکەی قاوەیی و سەوزی کەمڕەنگ و بێچەقڵە، لە بەشی سەرەوەی قەدەکەی چڵوپۆی گرژی کۆ بووەتەوە، گوڵەکانی سپی یان سوورە، بەرەکەی لە بادام چکوولەترە، توێکڵێکی مەخمەڵی هەیە و ناوکی تاڵە، لە دارەکەی داردەست و گۆچان دروست ئەکەن ▸ بادام تلخ کوهی

**ئارژنگی** / arjingî/: ☜ ئارژنگ

**ئارژەنگ** / arjeng/: ☜ ئارژنگ

**ئارسم** / arsim/: ناو. هەڵامەت؛ پەسیو؛ زوکام ▸ زُکام

**ئارسمی** / ars(i)mî/: ئاوەڵناو. هەڵامەتدار؛ پەسیودار ▸ زکامی

**ئارسێنیک** / arsênîk/: ناو. توخمێکی کیمیایی ناکانزایە بە ژمارەی ئەتومی ٣٣ و کێشی ئەتومی ٧٤،٩٢، بە ڕواڵەت لە کانزا دەکا و ڕەنگی بۆرە ▸ آرسنیک

**ئارش** / arş/: ناو. مانا؛ واتا ▸ معنی

**ئارشتی** / arişţî/: ناو. تیر؛ تیری پەیکاندار ▸ تیر پیکاندار

**ئارشک** / arşik/: ناو. قرقێنە؛ قرپ؛ قرپە؛ قوڵقێنە ▸ آروغ

**ئارفتە** / arifte/: ☜ ئارفتە

**ئارڤان** / arvan/: ناو. بارئاش؛ باراش؛ باری دەغڵ و دان کە دەبردرێ بۆ ئاش ‹ئاشەکی بهێلە کو تو ئارڤانێ خوە لێ بکی «پەند»› ▸ بار آسیاب

**ئارڤانە** / arvane/: ناو. وشتری مێ ▸ شُتر مادە

**ئارک** / ark/: ناو. ١. ئارد ٢. ئاردەمشار ▸ ١. آرد ٢. خاکارّە

**ئارکان** / arkan/: ☜ ئاگرپژێن

**ئارکۆرک** / arkork/: ناو. ماشە؛ مقاش؛ پەنگر ▸ انبُر

**ئارگ** / arg/: ☜ ئاگر

**ئارگا** / arga/: ناو. ١. ئاگردان ‹ئارگاکێ گەرمە کەرە› ٢. وجاخ؛ سێبەردەی کوانوو ▸ ١. آتشدان ٢. أجاق

**ئارگوشک** / erguşk/: ☜ ئەرزینگ

**ئارگون** / argun/: ناو. توخمی کیمیایی بە ژمارەی ئەتومی ١٨ و کێشی ئەتومی ٣٩،٩٤، کە گازێکی بەبێ ڕەنگ و بۆیە ▸ آرگُن

**ئارگۆش** / argoş/: ناو. کەروێشک؛ کەورێشک ▸ خرگوش

**ئارگۆن** / argon/: ئاوەڵناو. ئاورین؛ ئاگری؛ بە ڕەنگی سووری ڕۆشن ▸ آتشگون

**ئارگووشک** / ergûşk/: ☜ ئەرزینگ

**ئارگوون** / argûn/: ناو. تەندوور؛ تەنوور ▸ تنور

**ئارم** / arm/: ناو. لۆگۆ؛ درف؛ نیشانە؛ دروشم؛ هەوە؛ نیشانەی تایبەتی ڕێکخراوەیەک، بە شێوەی نووسراوە یان وێنە ▸ آرم

**ئارما** / arma/: ئاوەڵناو. دڵنیا؛ ئارخەیان ▸ خاطرجمع

**ئارماز** / armaz/: ناو. ١. گزمووڵە؛ گردیلە قوڕ ٢. گلۆڵە بەن و دەزوو ٣. جەنجەڕی ئاو هەڵکێشان ▸ ١. گلولەی گِل ٢. گلولەی نخ ٣. چرخ چاه

**ئارمانج** / armanc/: ناو. ١. نیشانە؛ کێلک ٢. دۆز؛ مەبەست؛ نیاز لە ژیانا ▸ ١. آماج ٢. آرمان

**ئارمانجانێ** / armancanê/: ناو. ئەزموونی ئەنگێوەیی؛ کێبەرکێ نیشانە داکردن ▸ مسابقەی تیراندازی

**ئارمانجخواز** / armancx(i)waz/: ئاوەڵناو. هۆگری بە ئامانج گەیشتن ▸ آرمان‌گرا

**ئارمویش** / armuyş/: ☜ هەورێشم

**ئارمووش** / armûş/: ☜ هەورێشم

**ئارمووشین** / armûşîn/: ئاوەڵناو. هەورێشمین؛ چنراو لە هەورێشم 🇮🇷 ابریشمین

**ئارمیش** / armîş/: ☜ **هەورێشم**

**ئارمین** / armîn/: ئاوەڵناو. ١. ئەهوەن؛ هێمن ٢. دەستەمۆ؛ ڕامکراو 🇮🇷 ١. آرام ٢. رام

**ئارن** / arin/: ناو. شەویلکە؛ کاکیلە؛ هەرکام لە دوو پێشەی بان و خواری دەم 🇮🇷 آرواره

**ئارنج** / arinc/: ناو. ئاخیە؛ مێخ زنجیر بۆ وڵاخ بەستنەوە 🇮🇷 میخ طویله

**ئارنگ** / aring/: ناو. ١. ئەسکەلەپیسە؛ ئاگرەی ئاژاڵ؛ سپڵەقەوێلە؛ ئاگرەی زمان؛ نەخۆشییەکی هاوبەشی مرۆڤ و ئاژەڵە ٢. بریقە؛ بریسکە ‹ئارنگی کریستاڵ› 🇮🇷 ١. سیاهزخم ٢. درخشش

**ئاروار** / arwar/: ناو. وشتری یەک ساڵە 🇮🇷 شتر یک ساله

**ئاروان** / arwan/: ناو. ١. ئازۆخەی ئارد لە ماڵدا ٢. تۆشەی سەفەر؛ نان و پێخۆری نێو ڕێ ٣. بەرزە؛ وشتریٚ سێ بەهاری دیبێ 🇮🇷 ١. آذوقەی آرد ٢. توشەی سفر ٣. شتر سه ساله

**ئاروانلۆک** / arwanlok/: ☜ **ئاروانە ـ١**

**ئاروانە** / arwane/: ناو. ١. ئاروانلۆک؛ وشتری چوار بەهار دیتوو ٢. ئارد 🇮🇷 ١. شتر چهار ساله ٢. آرد

**ئاروشک** / aruşk/: ناو. پشمە؛ پژمە؛ پنژ؛ پنژە؛ پێنژ؛ پێنیژ؛ بێنشک؛ بێنژک؛ بینشت؛ هەپش؛ فشک؛ کژ؛ دۆخی لە ناکاو و بە تێکڕا دەرپەڕینی هەوای نێو سی لە دەم و لووتەوە 🇮🇷 عطسه

**ئارومۆرە** / ar û more/: ناو. نیشاستەومۆرە؛ نیشاستە و ئامرازی ساوینی نیشاستە بە کاغەز و پارچە 🇮🇷 لوازم آغشتن کاغذ به نشاسته

**ئارویس** / arwîs/: ناو. وریس؛ گوریس 🇮🇷 رسن

**ئاروین** / arwîn/: ئاوەڵناو. بەئەزموون؛ ئەزموون وەرگرتوو 🇮🇷 باتجربه

**ئاروێ** / arwê/: ناو. خەیار؛ ئاروو 🇮🇷 خیار

**ئارۆ**[1] / aro/: ناو. هارۆ؛ ئیمڕۆ؛ ئەورۆ؛ ئەمڕۆ؛ ڕۆژێ تێدایین، نێوان دوێنێ و سبەینێ ‹ئینە هەرمانۆ ئارۆیمانە› 🇮🇷 امروز

**ئارۆ**[2]: ئاوەڵکار. هارۆ؛ ئیمڕۆ؛ ئەورۆ؛ ئەمڕۆ؛ لە ڕۆژی نێوان دوێنێ و سبەینێدا ‹ئارۆ مارۆش› 🇮🇷 امروز

**ئارۆختە** / aroxte/: ئاوەڵناو. ڕماو؛ وێران؛ خاپوور؛ کاول 🇮🇷 ویران

**ئارۆدە** / arode/: ئاوەڵناو. ماڵانگەڕ؛ تێوەتلاو 🇮🇷 بدکاره

**ئارۆزیان** / arozyan/: چاوگ. هەرووژان؛ وروژان 🇮🇷 به هیجان آمدن

**ئارۆشک** / aroşk/: ناو. ١. باوێشک؛ ئاژاژک ٢. پژمە؛ پشمە 🇮🇷 ١. خمیازه ٢. عطسه

**ئارۆشە**[1] / aroşe/: ناو. شەویلکە؛ کاکیلە 🇮🇷 آرواره

**ئارۆشە**[2]: ئاوەڵناو. بزۆز؛ نەحەجماو؛ سەربزێو 🇮🇷 شلوغ

**ئارۆک** / arok/: ناو. کفتە ساواری پانکەڵە کە لە گەنمە کوتاویش دەیکەن 🇮🇷 کوفتەی بلغور و گوشت

**ئارۆڵە** / arołe/: ناو. ما وشتر؛ وشتری مێنگە 🇮🇷 ماده شتر

**ئارۆنە** / arone/: ئاوەڵناو. سەربەرەخوار؛ بەراوەژوو 🇮🇷 وارونه

**ئارو** / arû/: ناو. ١. خەیار؛ هاروێ؛ ئاروێ ٢. ئاڵوو ٣. هاروو؛ پووک 🇮🇷 ١. خیار ٢. لوزتین ٣. لثه

**ئارووت** / arût/: ناو. *[باوەڕی کۆن]* فریشتەی هاوالی مارووت، لە چیرۆکاندا پێکەوەیان دەڵێن 🇮🇷 هاروت

**ئارووک** / arûk/: ناو. ١. ئاریک؛ ئاریگ؛ مێچ؛ بنەبان ٢. کفتەی برێش و گۆشت 🇮🇷 ١. سقف ٢. شامی کباب

**ئاروون و قاروون** / arûn û qarûn/: ناو. *[کینایە]* زۆر

دەولەمەند و دارا ▤ بسیار ثروتمند

**ئاره** / are/: ناو. ئارد ▤ آرد

**ئارەبانە** / arebane/: ☜ **ئەڕابە**

**ئارەپاتە**[1] / arepate/: ناو. گوتره؛ هەوەنتە ▤ تخمين؛ برآورد

**ئارەپاتە**[2]: ئاوەلکار. بەگۆتره؛ هەوەنتەیی ▤ تخميناً

**ئارەخچن** / arexçin/: ☜ **ئارەق‌چن**

**ئارەزوو** / arezû/: ناو. ئارزی؛ ئەزرۆ: ١. هیوا؛ ئاوات؛ ئومێد؛ هومێد؛ همێ؛ هەویا؛ تەوا؛ هۆ؛ بازگوڕ؛ هێڤی؛ چاوەڕوانی ڕووداوێکی خۆش ‹ئارەزوومە هەرچی ئینسانە بە ئازادی بژی «هێمن»› ٢. حەز؛ خواست؛ فز؛ واز؛ ئیشتیا؛ کەیف؛ مگێز؛ گێول؛ کاو؛ بابەتی دڵخواز ‹ئەمڕۆ دوو کەڕەت دڵ لە سەر خۆی چوو/ یار بە زۆر برا، بەبێ ئارەزوو «فولکلۆر»› ٣. ئەلیا؛ ئەلها؛ هەوەس ▤ ١تا٣. آرزو

▣ **ئارەزوو کردن**: ئیشتیا کردن؛ دڵ پێوە بوون ▤ آرزو کردن

**ئارەزووکەر** / arezûker/: ☜ **ئارەزوومەند**

**ئارەزوومەن** / arezûmen/: ☜ **ئارەزوومەند**

**ئارەزوومەند** / arezûmend/: ئاوەڵناو. ئاواتەخواز؛ ئاواتخواز؛ ئاوەتەواز؛ ئارەزوومەن؛ بە ئاوات؛ ئارەزووکەر؛ هیوادار؛ دڵبژۆک ‹مەدیان گولالان نە سای دەربەندان/ ئەو یەکتر وینەی ئارەزوومەندان «مەولەوی»› ▤ آرزومند

**ئارەزوومەندی** / arezûmendî/: ناو. تاسەباری؛ دۆخی بە تاسە بوون ‹ئارەزوومەندیم جە حەد ویەردەن/ فراوان خەیلێ تاسەو تۆم کەردەن «مەولەوی»› ▤ آرزومندی

**ئارەسە** / arese/: ناو. ئافەرین ▤ آفرين

**ئارەش** / areş/: ☜ **ئارەق ـ١**

**ئارەق** / areq/: ناو. هارەق؛ عارەق: ١. ئارەش؛ لێزک؛ خۆە ؛ خێ؛ خۆ؛ خوویە؛ تراوێکی زەلال و سوێر کە لە لووی ئارەق‌ڕێژی نێو پێستی گواندارانەوە دەدەڵێ و لە ئاو و چەند ماکی کانی و ئالی پێکهاتووه ٢. تراوی لە هەڵم تکاو ٣. ئاموور؛ ئاقیلە؛ باسکێش؛ ئێرەقە؛ ئاکیلە ▤ ١و٢. عَرَق ٣. قطعەی دراز خیش

▣ **ئارەق سەگی**: *[مەجاز]* ئارەق دەسی؛ ئارەقی تیژ و تون، بە ڕێژەیەکی زۆری ئەلکولەوە

▣ **ئارەق پێدەردان**: ١. بوونە هۆی ئارەق کردنی کەسێک ٢. *[مەجاز]* بوونە هۆی خەجاڵەتی کەسێک ▤ ١. عرق کسی را درآوردن ٢. کسی را شرمنده کردن

**ئارەق پێ‌کردن**: ١. هیلاک کردن ٢. *[مەجاز]* خەجالەت کردن ▤ ١. خسته کردن ٢. شرمنده کردن

**ئارەق دەردان**: ١. ئارەق کردن؛ ئارەق لە ئەندام دەرکەوتن ٢. *[مەجاز]* شەرمەزار بوون ▤ ١. عرق کردن ٢. شرمنده شدن

**ئارەق ڕشتن**: ١. ئارەق دەردان ٢. *[مەجاز]* زەحمەت کێشان؛ خۆ ماندوو کردن ‹ئاسنگەر بۆ تۆ پیک ئەوەشێنێ/ زارع بۆ تۆیە ئارەق ئەڕژێنێ «قانع»› ▤ ١و٢. عرق ریختن

**ئارەق کردن**: ئارەق دەردان؛ نەقتاندن؛ خۆ دان؛ خوەه دان؛ دەرکەوتنی دڵۆپەی عارەق لە سەر شتێ ▤ عرق کردن

**ئارەق گرتن**: تنۆکاندنی کولاتووی گژ و گیا (وەک: نەعنا و بیمشک و ...) یان میوە و دەنکی ترشاو (وەک: ترێ و سێو و ...) و بەرهەم هێنانی ئارەقیان ▤ عرق کشیدن

**ئارەقی ڕەش و شین دەردان**: زۆر هیلاک بوون ▤ بسیار خسته شدن

**ئارەقاوی** / areqawî/: ئاوەڵناو. بە ئارەق؛ خووساوی ئارەق ▤ عرق‌کرده

**ئارەق‌جۆش** / areqcoş/: ناو. ئارەق‌سووت؛ زیپکەی

ورد بە هۆی تاو لێ دان و ئارەق کردنی پێستی لەشەوە ☰ عرق‌سوز

**ئارەقچن** / areqçin/: ناو. ئارەقچین؛ عارەقچین؛ ئارەخچن: ١. تەقیلە؛ تاقیلە؛ کلاوێک لە کەتانی سپی کە تەوقی سەر دەگرێ ٢. بەڕووڵە؛ دارێکە دەیکەنە نێو کونی لووتی کەڵ یان وشتردا بۆ ئارام کردنەوە و ڕاکێشانی ☰ ١. عرق‌چین ٢. مهار (گاو، شتر)

**ئارەقچین** / areqçîn/: ☜ **ئارەقچن**

**ئارەقسوت** / areqsût/: ☜ **ئارەقجۆش**

**ئارەقفرۆشی** / areqf(i)roşî/: ناو. ١. مەیخانە؛ شەرابخانە؛ شوێنی ڕانان و خواردنەوەی مەی ٢. فرۆشگای خواردنەوەی ئەلکولی ٣. کاری فرۆشتنی عارەق. هەروەها: **ئارەقفرۆش** ☰ ١. میخانە ٢و٣. عرق‌فروشی

**ئارەقگیر** / areqgîr/: ناو. ئەرەقگیر: ١. نەرمەزین؛ تەکلتوو؛ تەکەڵتوو؛ پارچە لبادێکی تەنکە لە بن زینەوە دەخرێتە سەر پشتی ولاخی سواری ٢. فانیلە؛ ژێرکراس؛ کراس‌ئاسایەک، زۆرتر کەتانی، لە ژێر جلوبەرگی ترەوە دەکرێتە بەر ☰ ١. عرق‌گیر ٢. زیرپیراهن

**ئارەقە** / areqe/: ناو. ١. ئارەقی لەش ٢. دارێک لە ناو چینەی دیوار دەخرێ بۆ قایمتر کردنی ٣. هەڵم و هالاوی سەر شیشەی پەنجەرە ☰ ١. عرق ٢. چوب چینەی دیوار ٣. بُخار روی شیشە و پنجره

**ئارەگۆز** / aregoz/: ناو. ئارۆگۆز؛ ئاڵوگۆڕ ☰ تعویض

**ئارەمووک** / aremûk/: ناو. گامێشی قسر؛ گامێشی نەزۆک ☰ گاومیش سترون

**ئارەمەت** / aremet/: ناو. داڕێژەر ☰ ریختەگر

**ئارەنگ** / areng/: ئاوەڵناو. بەورشە؛ درەوشان؛ ڕەخشان ☰ درخشان

**ئارەو** / arew/: ناو. عەرەب. هەروەها: **ئارەوی** ☰ عرب

**ئارەوانە** / arewane/: ☜ **ئەڕابە**

**ئارەوەن** / arewen/: ناو. سەوڵ؛ دارناژ ☰ سرو

**ئارەی** / arey/: ئاوەڵناو. پڕ؛ تژی؛ دارماڵ ☰ پُر؛ مالامال

**ئارهان** / arhan/: چاوگ. ژان و ئێش کردنی ئەندامی سووتاو ☰ احساس کردن دردِ سوختگی

**ئارهاندن** / arhandin/: چاوگ. ١. چزاندن؛ داخ کردن بە ئاگر ٢. کولاندنەوە ☰ ١. داغ کردن ٢. ریش کردن

**ئارهایی** / arhayî/: ناو. ژانێکی هەمیشەیی لە لەشدا ☰ آزار

**ئاری**[١] / arî/: ناو. ١. کۆمەگ؛ یاریدە؛ هاریکاری ٢. خۆڵەمێش؛ بووڵ؛ مشکی خۆڵەکەوە ☰ ١. کمک ٢. خاکستر

**ئاری**[٢]: ئاوەڵناو. ١. ئاریایی؛ پێوەندیدار یا هاوگەر بە ڕەگەزی ئارییاییەوە ٢. نیشتەجێ؛ سەقامگیر لە شوێنێک ٣. گەورە؛ مەزن ☰ ١. آریایی ٢. مُقیم ٣. بزرگ

**ئاریا** / arya/: ناو. ١. مەڵبەندی ئاگر ٢. نەتەوەی کۆچەری سپی پێستی هیندوو- ئورووپایی کە لە پەنا کێوی ئارارات و باکووری ئێراندا نیشتەجێ بوون ☰ ١و٢. آریا

**ئاریان** / aryan/: چاوگ. ١. دڵ تێکچوون لە خواردنەوە ٢. کوان و زیپکە لە لەش هاتن ☰ ١. به حالت تهوع افتادن ٢. جوش زدن پوست

**ئاریباری** / arîbarî/: ناو. ١. بلالووک ٢. هەڵووچەی سووری پایزە ☰ ١. آلبالو ٢. آلوسرخ

**ئاریختێ** / arîxtê/: ناو. میراو؛ ئەو کەسەی دابەش کردنی ئاو بۆ ئاودێرانی بە دەستە ☰ میراب

**ئاریش** / arîş/: ناو. هێش؛ هەش؛ هۆش ☰ هوش

**ئاریشە** / arîşe/: ئاوەڵناو. ئارێشە؛ ئاسێە؛ دژوار؛

چەتوون ☰ دشوار

**ئاریشەن**[1] / arîşen/: ناو. تین و تاوی ژیان ☰ گرمی زندگی

**ئاریشەن**[2]: ئاوەڵناو. بەهۆش؛ وریا ☰ باهوش

**ئاریک** / arîk/: ☜ **ئاروك ــ١**

**ئاریکار** / arîkar/: ئاوەڵناو. هاریکار؛ هاریکەر؛ یاریدەر ☰ یاریگر

**ئاریکاری** / arîkarî/: ناو. هاریکاری؛ کۆمەگ؛ یاریدە ☰ کمک

**ئاریگ** / arîg/: ☜ **ئاروك ــ١**

**ئاریلە** / arîle/: ئاوەڵناو. ژنانیلە؛ ژنەڕەنگە؛ ئاغەباجی؛ ئاڵی پیواز ☰ زن‌نما

**ئاریمە** / arîme/: ناو. گەمە؛ کایە؛ یاری ☰ بازی

**ئاریندار** / arîndar/: ناو. ئالوودار؛ دەستەکی خانوو ☰ تیر چوبی سقف

**ئارینک** / arînk/: ناو. ١. پەلپ؛ بیانوو ٢. ئاردەنۆک ☰ ١. بهانه ٢. آرد نخود

**ئارینگ** / arîng/: ناو. مەلاشوو؛ مەلاشک؛ مەلاژی ☰ کام؛ سقف دهان

**ئارینۆک** / arînok/: ناو. ئالینۆک؛ ئارێنۆک؛ لەپە؛ لەتکە؛ نوخوەشەر؛ نخۆشەر ☰ لپه

**ئارینەک** / arînek/: ناو. ئاگاداری ☰ آگاهی

**ئارێ**[1] / arê/: ناو. بەڵێ؛ هەرێ؛ وەرامی ئەرێنی و پەسندکەر ‹تۆ بێژە ئارێ، من دەس‌بە کارێ! «مەسەل»› ☰ آری

**ئارێ**[2]: ئاوەڵکار. بەڵێ؛ هەرێ؛ ئەیچۆن؛ نیشانەی پێداگری و دڵنیایی ‹ئارێ برا وا ڕابرا «هەژار، *چوار ئامیلکە*»› ☰ آری

**ئارێخ** / arêx/: ناو. ١. ئاخیە؛ ئارنج؛ ئۆلک؛ مێخ‌زنجیر؛ سکە؛ مەڕبەند؛ مێخ‌سکە؛ کلب؛ گولمیخ؛ گولمێخ؛ میخانە؛ سنگەکەر؛ بزماری زلی سەر گۆپکە ٢. دارتار؛ دارێکی درێژ لە ئەڕابەدا ☰ ١. میخ‌طویله ٢. چوب بلند ارابه

**ئارێز**[1] / arêz/: ناو. تەپ؛ تەپۆلکی بەرز ☰ تپه

**ئارێز**[2]: ئاوەڵناو. بەڕێز؛ گەورە؛ مەزن ☰ بلندمرتبه

**ئارێشە** / arêşe/: ☜ **ئاریشە**

**ئارێنج** / arênc/: ناو. کوانی بن هەنگڵ؛ قونێر، کە لە بن باخەڵ دەردەچێ ☰ دُمل زیر بغل

**ئارێنۆک** / arênok/: ☜ **ئارینۆك**

**ئارێنە** / arêne/: ناو. نێوەڕاستی لەش؛ لای سەرووی ڕان و خوارەوەی بالاتەنە ☰ میان

**ئاڕفتە** / ařifte/: ئاوەڵناو. ئارفتە؛ ئاڕۆفتە؛ ئاڕەفتە؛ لەکارتە؛ لەکارکەوتە؛ پەک‌کەوتە؛ کەلک‌بڕاو ☰ از کار افتاده

**ئاڕڤانە** / ařvane/: ناو. وشتر ☰ شتر

**ئاڕوگۆڕ** / ař û goř/: ☜ **ئازوگۆز**

**ئاڕوگۆز** / ař û goz/: ☜ **ئازوگۆز**

**ئاڕۆفتە** / ařofte/: ☜ **ئاڕفتە**

**ئاڕەفتە** / ařefte/: ☜ **ئاڕفتە**

**ئاڕین** / ařîn/: ☜ **هاڕین**

**ئاز**[1] / az/: ناو. ١. زیپکەی شیری؛ زیپکەی سەر ڕوومەتی منداڵی شیرەخۆر ٢. جوانەزمە؛ زیپکەی دەم و چاوی لاوان ٣. هێز؛ وزە ☰ ١. جوش صورت بچه‌ی شیرخوار ٢. جوش جوانی ٣. قُدرت

**ئاز**[2]: ئاوەڵناو. ١. ساغ و ڕاست؛ بێ‌فڕوفێڵ ٢. دژوار؛ چەتوون؛ سەخت ‹بۆ میوانی خانۆی کورد دەچم، بەلام ڕێگا ئاز و چەتوونە «دمدم»› ☰ ١. درستکار ٢. دشوار

⊡ **ئاز بوون** هێز وە بەر هاتنەوە ‹ئاز بە و باز دە! «مەسەل»› ☰ نیرو گرفتن

**ئازا**[1] / aza/: ناو. ئەندامی لەش ‹ئازای ئەنامم ئەیشێ!› ☰ اعضا (بدن)

**ئازا**[2]: ئاوەڵناو. ١. نەترس؛ ڕەشید؛ بەغیرەت ‹ئازا، عومرێ جارێ دەمرێ، ترسەنۆک ڕۆژێ هەزار جار «مەسەل»› ٢. بەکاکڵ ‹گوێز ئازا› ٣. ئازاد؛

سەربەست ‹ئازا و ڕزگار بم، شادان و خەندان/ یان زنجیر لە مل لە سووچی زیندان «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ ١. شُجاع ٢. پُرمغز ٣. آزاد

**ئازا**[٢]: ئاوەڵکار. خێرا؛ زوو؛ بە پەلە ‹ئازا کە!؛ ئازا وەرەوە!› ☰ زود؛ سریع

**ئازاتی** / azatî/: ☜ **ئازایەتی**

**ئازاجەوت** / azacewt/: ناو. توێخڵی ژێرەوەی بەڕوو ☰ پوستەی داخلی بلوط

**ئازاد** / azad/: ئاوەڵناو. ڕزگار؛ ڕاهی؛ سەربەست ☰ آزاد

⊡ **ئازاد کردن**: ١. لە زیندان بەردان؛ لە گیرۆدەیی ڕاهی کردن ٢. لێ خۆش بوون؛ عافوو کردن * هەروەها: **ئازاد بوون** ☰ ١. آزاد کردن ٢. بخشیدن

**ئازادە** / azade/: ئاوەڵناو. سەرپەتی؛ سەربەست و کۆڵنەدەر ☰ آزادە

**ئازادی** / azadî/: ناو. ڕزگاری؛ سەربەستی ☰ آزادی

**ئازادیخوا** / azadîx(i)wa/: ☜ **ئازادیخواز**

**ئازادیخواز**[١] / azadîx(i)waz/: ناو. ئازادیخوا؛ ئازادیواز؛ ڕزگاریخواز ‹ئازادیخوازێکی گەورە بوو› ☰ آزادیخواه

**ئازادیخواز**[٢]: ئاوەڵناو. ئازادیخوا؛ ئازادیواز؛ ڕزگاریخواز ‹مرۆ بەگشتی ئازادیخوازە› ☰ آزادیخواه

**ئازادیخوازی** / azadîx(i)wazî/: ناو. هشازایی؛ ڕزگاریخوازی؛ لایەنگری و خوازیاریی ئازادی ☰ آزادیخواهی

**ئازادیواز** / azadîwaz/: ☜ **ئازادیخواز**

**ئازار** / azar/: ناو. هازار: ١. ئێش و ژان ‹دوو ماچی لێوە، ئەویش پێوە دەمرم و نابێ/ نەسیبی ئەو دڵی وا پڕ لە دەرد و ئازارم «ئاوات»› ٢. چز؛ چزوو؛ چزە؛ قەگەز؛ ئەستنگ ‹زولفانی سییەهـ ماری بە ئازاری دڵی زار/ گاهێ لە یەسارن بە جەفا، گەهـ لە یەمینن «نالی»› ٣. ئاهۆ؛ پەتا و درم ‹ئازاری گولی› ٤. ئادار؛ مارس ☰ ١. آزار ٢. نیش ٣. مرض واگیردار ٤. مارس

▣ **ئازاری سی**: دەردەباریکە؛ ئازاری سیل و دیق ☰ سل

⊡ **ئازار دان**: ئازاراندن؛ گەهراندن؛ ئێش پێ گەیاندن؛ عەزیەت دان ☰ آزُردن

**ئازار گرتن**: تووشی نەخۆشی تووش و ناخۆش هاتن ‹بمرێ ئەو کەسەی کە شەڕی ئەوێ/ ئازارێ بگرێ ژانی نەسرەوێ «قانع»› ☰ مرض گرفتن

**ئازارخوازی** / azarx(i)wazî/: ناو. مازوخیسم ☰ مازوخیسم

**ئازاردراو** / azard(i)raw/: ئاوەڵناو. دڵشکاو ☰ آزُردە

**ئازاردەر** / azarder/: ئاوەڵناو. زیاندەر ☰ موذی

**ئازاردەری** / azarderî/: ناو. سادیسم ☰ سادیسم

**ئازارناسی** / azarnasî/: ☜ **ئاسیوناسی**

**ئازارەباریکە** / azarebarîke/: ناو. دەردەباریکە؛ سیل ☰ سل

**ئازارەمریشک** / azarem(i)rîşk/: ناو. نەخۆشیی مریشک کە جارـ جارێ دێ و گەلێ مەل و مریشک لە نێو دەبا ☰ آنفلوآنزای مُرغی

**ئازاڵە** / azałe/: ناو. ئارزاڵە: ١. سووتەمەنی زستانە؛ ئاوردووی زستان ٢. لاسی وشکەوەبووی دەر و دەشت بۆ سووتاندن ☰ ١. سوخت زمستانی ٢. سرگین خُشک

**ئازانە** / azane/: ☜ **ئازایانە**

**ئازایانە**[١] / azayane/: ئاوەڵناو. ئازانە؛ بوێرانە ‹هەڵوێستی ئازایانە› ☰ شُجاعانە

**ئازایانە**[٢]: ئاوەڵکار. ئازانە؛ بوێرانە ‹ئازایانە قسەی دەکرد› ☰ شُجاعانە

**ئازایەتی** / azayetî/: ناو. ئازاتی؛ نەترسی؛ گەڕناسی؛ غیرەت ☰ شُجاعت

**ئازایی** / azayî/: ناو. ١. ئازایەتی ٢. ئازادی؛

ڕزگاری ‹لە هەموو گەردن ئازایی دەخوازم› ☰ ١. شُجاعت ٢. آزادی

**ئازپێش** / azpêş/: ناو. ئاشپەز؛ چێشتلێنەر ☰ آشپز

**ئازتەی** / aztey/: ☜ **ئاستەی**

**ئازدەنگ** / azdeng/: ناو. ١. چەخماخە؛ بەرقی هەورەتریشقە ٢. ڕەگی ئاورین؛ شۆڵەی درێژی ئاور ☰ ١. آذرخش ٢. رگەی آتش

**ئازراندن** / az(i)randin/: چاوگ. ئێشاندن؛ عەزیەت دان ☰ آزُردن

**ئازری** / az(i)rî/: ناو. برینی بە چڵک و کێم و هەوا ☰ زخم چرکین

**ئازرین** / az(i)rîn/: چاوگ. لە ئازاردا بوون ☰ در عذاب بودن

**ئازگار** / azgar/: ئاوەڵناو. تەواو؛ ڕەبەق؛ بە شوێن یەکدا بێ بڕانەوە و نێوان ‹دە ساڵی ئازگار لە زیندان بوو› ☰ آزگار

**ئازمایشگا** / azmayişga/: ناو. تاقیگە ☰ آزمایشگاه

**ئازمووده** / azmûde/: ئاوەڵناو. تاقیکراو؛ تەجرەبەکراو؛ هەڵسەنگێنراو ‹ماستی ئازمووده لە کەرەی نائازمووده چاترە «مەسەل»› ☰ آزموده

**ئازمێز** / azmêz/: ناو. جۆرێ کایەی منداڵانە وەک شەشخان وایە و خانەی ئەمەیان گردە ☰ از بازیهای کودکانه

**ئازنج** / azinc/: ناو. خانووی بەردی یەک قاتی ☰ خانەی سنگی یک طبقه

**ئازنگ** / azing/: ناو. خانووی بە سەر تەختەبەردی پانەوە دروستکراو ☰ خانەی ساختە شدە بر تختە سنگ

**ئازوباز** / az û baz/: ☜ **ئازوبەزە**

**ئازوبەزە** / az û beze/: ناو. ئازوباز؛ ئۆباڵ؛ هۆباڵ ‹ئازوبەزەت وە ملم من ئەم کارەم نەکردووە› ☰ وبال

**ئازوگوێز** / az û g(i)wêz/: ☜ **ئازوگۆز**

**ئازوگۆز** / az û goz/: ناو. ئازوگوێز؛ ئاڕوگۆڕ؛ ئاڕوگۆز؛ ئاڵوگۆڕ ☰ نقل مکان

**ئازوخە** / azûxe/: ناو. ئازووقە؛ تفاق؛ بژیوی پێداویست لە ماڵدا ☰ آذوقە

⊡ **ئازوخە داخستن**: تفاق خستن؛ بژیوی زستانە دابین کردن ☰ آذوقە اندوختن

**ئازوقە** / azûqe/: ☜ **ئازوخە**

**ئازە** / aze/: جێناو. ڤێ؛ ئەو (بۆ مێ) ☰ او (مؤنث)

**ئازەب** / azeb/: ئاوەڵناو. سەڵت؛ ڕەبەن (بۆ پیاو)؛ عازەو؛ ئازەو؛ مانگوڕ (بۆ ژن)؛ زگورد؛ زوگورد؛ زوگورتی؛ قازاخ ☰ عزب؛ مُجرد

**ئازەبە** / azebe/: ☜ **ئازەبەت**

**ئازەبەت** / azebet/: ناو. ئازەبە؛ ئازەوانە؛ ئازەوە؛ عازەوی؛ عازەبی؛ زیپکەی دەم و چاوی تازەلاوان ☰ جوش جوانی

**ئازەپ** / azep/: ناو. کۆیلەی بە دراو کڕدراو ☰ بردەی زرخرید

**ئازەخ** / azex/: ناو. بالووکە؛ بالووک؛ زیپکەئاساییەکی ڕەقی بێژانە لە دەستوپل دێت ☰ زگیل

**ئازەر** / azer/: ناو. ١. ئاور؛ ئاگر ٢. سەرماوەز؛ نۆهەمین مانگی ئێرانی ☰ ١. آتش ٢. آذر

**ئازەرمە** / azerme/: ئاوەڵناو. لاو؛ جەحێڵ؛ گەنج؛ عازەو ☰ جوان

**ئازەرین**[1] / azerîn/: چاوگ. لە سەخڵەتدا بوون؛ لە ئازاردا بوون ☰ در رنج بودن

**ئازەرین**[2]: ئاوەڵناو. ئاورین ☰ آذرین

**ئازەنتی** / azentî/: ناو. ڕاوە؛ شرۆڤە؛ کاری مانا لێدانەوە؛ شی کردنەوەی دەقێک بە نووسراوێک ☰ شرح و تفسیر

**ئازەو** / azew/: ☜ **ئازەب**

**ئازەوانە** / azewane/: ☜ **ئازەبەت**

**ئازەوە** / azewe/: ☜ **ئازەبەت**

**ئـازەوی** / azewî/: نـاو. ١. لاوی؛ جحێڵـــی ٢. ئازەوانە ▤ ١. جوانی ٢. جوش عزبی

**ئازیای** / azyay/: چاوگ. دالەقان؛ هەڵواسـران ▤ آویختن؛ آویزان شدن

**ئـازیز** / azîz/: ئاوەڵـناو. عـــازیز؛ خۆشەویســـت؛ خوەشەویس ▤ عزیز؛ گرامی

**ئـازیزمردە** / azîzmirde/: ئاوەڵـناو. تازیـــەتبار؛ تازیەدار؛ خۆشەویست مردوو ▤ عزیزمُردە

**ئازیزە** / azîze/: ناو. لە هەوا کۆن و ڕەسـەنەکانی مۆسیقای کوردی ‹بە هەوران پاییزە/ دەخوێنن ئازیزە/ یارکۆڵێم لێزیزە «فولکلۆر»› ▤ از نغمەهای اصیل کُردی

**ئازیەت** / azyet/: ناو. تازیە؛ عازیەت؛ ئازیەتی؛ پرسە ▤ عزا؛ ماتم

**ئازیـــەتبار** / azyetbar/: ئاوەڵـــناو. تازیـــەدار؛ عازیـــەتبار؛ عازیتبـــار؛ ماتـــەمین؛ خـــەمباری خۆشەویست مردوو ▤ عزادار

**ئازیەتباری** / azyetbarî/: نـاو. ماتـەم؛ سـوێ ▤ سوگ

**ئازیەتی** / azyetî/: ناو. ئازێتی؛ ئازیەتباری؛ پرسە؛ شینگێڕی ▤ سوگواری

**ئازێ** / azê/: ☜ نارزێ

**ئازێتی** / azêtî/: ☜ ئازیەتی

**ئاژ** / aj/: ئاوەڵناو. زبر و زوور؛ نەپۆڕ ▤ زبر؛ خشن

**ئاژئاژە** / aj'aje/: ☜ ئاژاژک

**ئاژئاژەکی** / aj'ajekî/: ☜ ئاژاژک

**ئـاژار** / ajar/: نـاو. بـــەهرە و داهـــاتی زەوی ▤ محصول و عایدی زمین

**ئاژاژک** / ajajik/: نـاو. ئاژئاژە؛ ئاژئاژەکی؛ ئـاژاژکی؛ ئاژاژگی؛ ئاژاشکە؛ ئارۆشک؛ باوێشک ▤ خمیازە

**ئاژاژکی** / ajajkî/: ☜ ئاژاژک

**ئاژاژگی** / ajajagî/: ☜ ئاژاژک

**ئاژاشکە** / ajaşke/: ناو. ١. ☜ ئاژاژک ٢. مجورک؛ مووچرک؛ تەزوو ▤ ١. ☜ ئاژاژک ٢. مورمور

**ئاژاڵ** / ajał/: ناو. ١. پاتاڵ؛ وڵسات؛ گـا و گـۆل و مەڕ و مالات ٢. پڕوپووش؛ چیلکەوچاڵ ٣. شـتی بەکەڵـک نـەهاتوو ▤ ١. دام؛ احشـام ٢. خـس و خاشاک ٣. خرتوپرت

**ئـاژان** / ajan/: ناو. قۆڵچی؛ پاسەوان ‹سەر مانگ وە مانگ بایتە دیارم/ ... / بووشی کرا دەی یا ئاژان بارم؟ ... «شامی کرماشانی»› ▤ پاسبان

**ئاژانس** / ajans/: ناو. ١. نوێنەرایـەتی؛ پێشـکاری ٢. بنکـە؛ بنگـە ٣. تاکسـی تەلـەفۆنی ▤ ١تـا٣. آژانس

**ئاژاولە** / ajawle/: ☜ ئاژاوە

**ئاژاوڵە** / ajawłe/: ☜ ئاژاوە

**ئـاژاوە** / ajawe/: نـاو. ئاژاولـە؛ ئاژاوڵـە؛ بشـێوی و کەس لە کەسی ▤ آشوب

⊡ **ئاژاوە نانەوە**: کەتن گێڕان؛ فتنە نانـەوە؛ شـەڕ هەڵخڕاندن ▤ آشوب بە پا کردن

**ئـــاژاوەچی** / ajaweçî/: ئاوەڵـــناو. کەتنگێـــڕ؛ شەڕهەڵایسـێن؛ شەڕهەڵـخڕێن؛ سەرەسـۆدرە؛ مایەفتنە ▤ آشوبگر

**ئـاژاوەگێڕ** / ajawegêř/: ئاوەڵـناو. ١. ئاشەکڵـــە؛ شـۆفار ٢. شەڕهەڵایسـێن؛ گێرەشـێوێن ▤ ١. سخنچین ٢. آشوبگر

**ئاژدا** / ajda/: ☜ نەجداد

**ئاژداد** / ajdad/: ☜ نەجداد

**ئاژر** / ajir/: ناو. ڕک؛ ڕق؛ تووڕەیی؛ قین ▤ خشم

**ئاژری** / aj(i)rî/: ئاوەڵـناو. تووڕە؛ بەڕک؛ ڕقهەستاو ▤ خشمگین

**ئاژک** / ajik/: ناو. بادامەکێویلە ▤ بادام کوهی

**- ئاژن** / ajin-/: پاشەوشە. ١. تێچـەقێن؛ تێوەکـەر ‹دەرزیئاژن؛ سووژنئاژن› ٢. ـ فەکۆڵ ‹ددانئاژن› ▤ ١و٢. ـ آجین

⊡ **ئاژن کردن**: ١. ئـاژین کـردن؛ ئـاو بەردانـە نـاو

مەزرا ۲. بیراز کردنی بەرد یان هەر شت 🇮🇷 ۱. آب بستن بە مزرعە ۲. آجکاری کردن

**ئاژن ـ ئاژن** / ajin ajin/: ئاوەڵناو. کون ــکون (بە گوللە و دەرزی و ...) 🇮🇷 سوراخ ـ سوراخ

**ئاژنگ** / ajing/: ☜ **ئارژنگ**

**ئاژنە** / ajne/: ناو. ۱. بنچکــی پرســاقەتە بــۆ ئاخنینی سەر ڕۆچن ۲. چیلکەیــەک بــنی ددانی پێ پاک دەکەنەوە ۳. تۆپزی پەڕۆ یان خوری کە زستانان لە ســەر کــونی ڕۆچــن دایــدەنێن 🇮🇷 ۱. بُتەی پرشاخ و بـرگ ۲. خـلال دنـدان ۳. سـرپوش زمستانی روزنەی بام

**ئاژنی** / ajnî/: ناو. مەلە؛ سۆبایی؛ مەلەوانی 🇮🇷 شنا

**ئاژنین** / ajnîn/: چاوگ. تێپەڕ. //ئاژنیــت؛ دەئــاژنی؛ بئاژنە// ۱. کۆڵینەوە و تێوە کردنی نووکی تیژ بــە شتێکدا ۲. داخستن؛ بەستن ۳. کەندن؛ داکەنــدن ‹کراســەکەم ئــاژنی› ٤. زبــر کــردن؛ زرب کــردن؛ کونجر ـ کـونجر کـردنی بـەرداش و... ٥. ئـاژن کــردن 🇮🇷 ۱. آجیــدن ۲. بســتن ۳. درآوردن ۴. زِبــر کردن آسیا سنگ ۵. خلال کردن

■ ئاوەڵــناوی بــەرکاری: ئاژنیــاگ/ چـاوگی نــەرێنی: نەئاژنین

**ئاژوان**[1] / ajwan/: چاوگ. ئاژۆتن؛ لێخوڕین؛ بردنــە ڕێوە 🇮🇷 راندن

**ئاژوان**[2]: ناو. لێخوڕ؛ سەیاق 🇮🇷 رانندە

**ئاژوەر** / ajwer/: ناو. شۆفێر؛ سەیاق 🇮🇷 رانندە

**ئاژۆ** / ajo/: ناو. جووڵە؛ حەرەکەت 🇮🇷 حرکت

⊡ **ئـاژۆ دان**: ۱. لــێخــوڕین؛ وەڕێ خســـتن ۲. لەوەڕاندنی ئاژەڵ بە شەو 🇮🇷 ۱. راندن؛ بە حرکت درآوردن ۲. شب بە چرا بُردن گلە

**ئاژۆتن** / ajotin/: چاوگ. تێپەڕ. //ئاژۆتــت؛ دەئــاژۆی؛ بئــاژۆ// ئــاژووتن: ۱. لێخــوڕین؛ ئــاژوان ۲. ڕادان؛ بڵاو بوونەوەی ئاژەڵ بە دەشت و ســەحرادا 🇮🇷 ۱. راندن؛ رانندگی کردن ۲. پخش شدن دام در صحرا

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەئاژۆتن

⊡ **ئاژۆتنە سەر**: پەلامار بۆ بردن؛ هەڵکوتانە ســەر 🇮🇷 حملە بُردن

**ئـاژۆتی** / ajotî/: نـاو. زەوی کێڵــراو؛ شــێوکراو 🇮🇷 زمین شخمزدە

**ئاژووتن** / ajûtin/: ☜ **ئاژۆتن**

**ئاژەڵ** / ajeł/: ناو. ئاژاڵ؛ ماڵات؛ وڵسات 🇮🇷 احشام

**ئاژەڵدار** / ajełdar/: نـاو. دەوڵــەتدار؛ خـــاوەن مەڕوماڵات 🇮🇷 دامدار

**ئاژەڵداری** / ajełdarî/: نـاو. دەوڵــەتداری؛ کــاری مەڕوماڵات بەخێو کردن 🇮🇷 دامداری

**ئاژەنای** / ajenay/: چاوگ. ئاژنین 🇮🇷 آجیدن

**ئاژەوەن** / ajewen/: ناو. سەوڵ 🇮🇷 سرو

**ئاژیر** / ajîr/: ئاوەڵناو. ژیر؛ تێگەیشتوو 🇮🇷 فهمیدە

**ئاژین**[1] / ajîn/: چاوگ. ۱. زرو بوون (وەک: برپەنـد، بەرداش) ۲. ئاژن کردن؛ ئاو بەردانە نـاو مــەزرا 🇮🇷 ۱. زبر بودن ۲. آب بستن بە مزرعە

**ئاژین**[2]: ئاوەڵناو. سەقامگرتوو؛ دامەزراو 🇮🇷 مُستقر

**ئاژینە** / ajîne/: نـاو. ۱. تەقتــەقۆک؛ تەقەنــە؛ چەقچەقە؛ چەقچــەق؛ چەقچــەقۆک؛ چەقەنــەی ئاش ۲. چەکوشی بــیراز کــردن کــە ســەرەکەی ددانەی هەیە 🇮🇷 ۱. لکلکە/ کلندەی آسیاب ۲. آژینە

**ئـاس**[1] / as/: نـاو. ۱. قــاقوم؛ قــاقم؛ جانــەوەرێکی تووک سپی لــە تــیرەی بانبانــک و سمــۆرە، کــە کەوڵی زۆر بەنرخە ۲. تــەکخاڵ؛ تەکــە؛ پــەرێکی وەرەق 🇮🇷 ۱. قاقُم ۲. تکخال

**ئاس**[2]: لێل. ← **ئاس‌وپاس**

**ئاسا**[1] / asa/: ناو. ئاسیاو؛ ئاش 🇮🇷 آسیاب

**ئاسا**[2]: ئاوەڵکار. ئەوسا؛ ئەو وەختە 🇮🇷 آنگاه

**. ئاسا**[3]: پاشەوشە. وەکوو؛ وەک ‹منیش خۆت‌ئاسا ئەو کارەم کرد› 🇮🇷 ـ آسا

**ئاسار** / asar/: ناو. ۱. بنەڕەت؛ بناغە ۲. شوێنەوار 🇮🇷 ۱. پایە و اساس ۲. آثار

**ئاساره** / asare/: ☜ **ئەستێره**

**ئاسارەزلە** / asarez(i)le/: ناو. ئەستێرەی ڕۆژ ☰ ستارەی صُبحگاهی

**ئاسان** / asan/: ئاوەڵناو. هاسان؛ هەسان؛ عاسان؛ هێسان؛ سانا ☰ آسان

**ئاسانبژیو** / asanb(i)jîw/: ئاوەڵناو. خاوەن ژیانی ساکار و سادە ☰ سادەزیست

**ئاسانسۆر** / asansor/: ناو. سانابەر؛ هۆدەیەکی چکۆلە (زۆرتر کارەبایی) بۆ بان و خوار پێ کردنی مرۆ یان بار ☰ آسانسور

**ئاسانکاری** / asankarî/: ناو. ساناکاری؛ پشتیوانی و پشتگری وا کە کار خێراتر جێبەجێ ببێ ☰ کمک به پیشرفت کار

**ئاسانە** / asane/: ناو. ئاستان؛ ئاستانە: ١. ژێردەرانە؛ ژێربەران؛ داری لای خوارووی چوارچێوەی دەرگا ٢. بەردەرک؛ پێش‌ماڵ؛ بەر دەرگا؛ بەرماڵی گەورەماڵان ‹من شەوێ ناڵەم جۆش ئاوەردە بۆ/ سەگی ئاسانەت بێدار کەردەبۆ «مەولەوی»› ☰ ١. پایین چارچوب در ٢. آستانه

**ئاسانی** / asanî/: ناو. هاسانی؛ سانایی ☰ آسانی

**ئاساو** / asaw/: ناو. ئاسیاو؛ ئاشی ئاو؛ دام و دەزگای دەخڵ هاڕین ☰ آسیاب

**ئاساوان** / asawan/: ناو. ئاساوچی؛ ئاشەوان ☰ آسیابان

**ئاساوبەتاڵ** / asawbetał/: ☜ **ئاش‌بەتاڵ**[٢]

**ئاساوچی** / asawçî/: ☜ **ئاساوان**

**ئاسایش** / asayiş/: ناو. ئاسایشت: ١. ئارامی؛ هێمنی ‹کە جەیشی غەم هجوومی کرد، نیزامی عومری من تێکچوو/ ئیتر مومکین نییە ئاسایشی حاڵی پەرێشانم «ئەمین فەیزی بەگ»› ٢. ئەولەهی؛ دۆخ یان چۆنیەتی نەبوونی مەترسی یان بشێوە ‹ئاسایشی نەتەوەیی؛ ئاسایشی ئابووری› ٣. ئیسراحەت؛ دۆخ یان ڕەوتی حەسانەوە ‹ڕۆح جە تاوبای زامی گیر و گاز/ پەرێ ئاسایش ئاماوە پەرواز «بێسارانی»› ٤. دامەزراوەیەکی دەوڵەتی کە بە نیازی بەرگری لە دەستێوەردانی دزەکی دژمنان و نەهێشتنی مەترسی لە سەر کۆمەڵگاوە دابین کراوە ☰ ١. آرامش ٢. امنیت ٣. آسایش ۴. ادارەی اطلاعات

**ئاسایشت** / asayişt/: ☜ **ئاسایش**

**ئاسایشتخواز** /asayiştx(i)waz/: ☜ **ئاسایش‌خواز**

**ئاسایش‌خواز** / asayişx(i)waz/: ناو. ئاسایشت‌خواز؛ هێمنی‌خواز ☰ آسایش‌طلب

**ئاسایی**[١] / asayî/: ئاوەڵناو. ئالوە: ١. سازگار لەگەڵ خوو یا نەریتدا ‹فڕۆکەکە لە کاتی نیشتنەوەدا چەند مەترێک لە ڕێڕەوی ئاسایی خۆی لای‌دا› ٢. بێ‌هیچ تایبەتمەندییەکی بەرچاو ‹قسەی ئاسایی› ٣. ڕەمەکی؛ بەبێ سەرتری و هەڤیازی ‹ئەفسەرێکی ئاسایی! کە یەکەم ئەستێرەی وەرگرت/ ئەستێرەیەکی کوشتبوو «شێرکۆ بێکەس»› ٤. بە بارودۆخ یان چۆنیەتی باو ‹هەنگاو نان لە ژیانێکی ئاسایی بەرەو ژیانێکی پێشکەوتوو› ٥. وەک خۆی؛ وەک بووە؛ لە سەر دەقی خۆی ‹ئاخۆ واشیگنتۆن دەیەوێت عیراق بۆ دۆخی ئاسایی بگەڕێتەوە؟› ☰ ١. معمول ٢. عادی ٣و۴. معمولی ۵. طبیعی

• **ئاسایی**[٢]: پاشەوشە. چەشن ‹خۆت‌ئاسایی› ☰ ـ مانند

**ئاسپایی** / aspayî/: ☜ **ئەسپایی**

**ئاسپنای** / asp(i)nay/: چاوگ. پەساردن ☰ تکیه دادن

**ئاست**[١] / ast/: ناو. حاست: ١. ڕادە؛ جێگا؛ شوێن ٢. ئاغا؛ جەناب؛ میر ☰ ١. مکان ٢. جناب

▣ **لە ئاست**: لە بەرانبەر؛ لە حاند ‹لە ئاستت چاوم هەڵنایە› ☰ در مُقابِل

**ئاست**[٢]: ئاوەڵناو. ئاستەم؛ زەحمەت؛ چەتوون ☰ دشوار

**ئاستاتین** / astatîn/: ناو. توخمێ کیمیایی

ڕادیۆئەکتیف، لە گرۆی هالۆژینەکان، بە ژمارەی ئەتومی ٨٥ و کێشی ئەتومی ٢١٠ ☰ آستاتین

**ئاستان** / astan/: ☜ **ئاسانە**

**ئاستانگ** / astang/: ☜ **ئاستەنگ**

**ئاستانە** / astane/: ☜ **ئاسانە**

**ئاستن** / astin/: چاوگ. هێشتن؛ دەس لێهەڵگرتن ☰ هشتن

**ئاستۆن** / aston/: ناو. بەردەرگا؛ بەرماڵ ☰ آستانه

**ئاستە** / aste/: ناو. تۆمار ☰ طومار

**ئاستەڕ** / asteř/: ناو. ئاسەڕ؛ هاسەر؛ بەر؛ زەخەرە؛ هەوبەر؛ هەوجەر؛ توێی ناوەوەی جلوبەرگ ☰ آستر

**ئاستەم** / astem/: ناوەڵناو. حاسێ؛ دژوار و هەڵەموت (کێو) ‹تەرەغە کێوێکی ئاستەمە› ☰ دشوارگُذر

**ئاستەمی** / astemî/: ناو. سەختی؛ دژواری ☰ سختی

**ئاستەنگ** / asteng/: ناوەڵناو. ئاستانگ؛ ئەستەنگ؛ سەخت و تەنگەبەر (کێو و ڕێگا). هەروەها: **ئاستەنگی** ☰ دشوارگذر

**ئاستەی** / astey/: چاوگ. ئازتەی؛ ئاسەی؛ هێشتن؛ تلێن؛ ڕێ دان ☰ اجازه دادن؛ گذاشتن

**ئاستێرە** / astêre/: ☜ **ئەستێرە**

**ئاسرم** / asirm/: ناو. هەلامەت؛ پەسیو؛ زوکام ☰ زُکام

**ئاسرمە** / asirme/: ناو. ئاشرمە؛ باریکە چەرمێک لە کورتاندا دەکەوێتە سەر کلکی بارەبەر ☰ نوار چرمی دُم پالان

**ئاسک** / as(i)k/: ناو. مامز؛ مامبز؛ کەژاڵ؛ خەزاڵ ☰ آهو

**ئاسکانی** / askanî/: ناو. جۆرێ هەڵپەڕکێ ☰ نوعی رقص کردی

**ئاسکۆڵ** / askoł/: ناو. کارمامز؛ بێچووە ئاسک ☰ آهوبرّه

**ئاسکۆڵە** / askołe/: ناو. کارخەزاڵ ☰ غزال‌برّه

**ئاسمان** / asman/: ناو. ئەزمان؛ ئەزمێن؛ حاسمان؛ عاسمان؛ عەزمان؛ ئاسمانگ؛ ئاسیمان؛ ئاسمین؛ ئاسمێن؛ ئاسمیا؛ ئازمان؛ ئازمێن؛ ئازموو؛ بەرزاییێ کە ئەستێرە و مانگ و ڕۆژی تێدا دەبینرێ ☰ آسمان

⊡ **ئاسمان بەرز و زەوی سەخت بوون**: *[کنایه]* هیچ ڕێچار و جێ دەرباز بوون نەمانەوە ‹ئەگەر هەڵدێم، تاوانەکەم بە سەردا دەسەپێ، ئەگەر دادەنیشم دەستم لە سەر هەڵناگرن و هەر تووش دەبم، ئاسمان بەرز و زەوی سەخت!› ☰ راه پس و پیش نداشتن

**ئاسمان کوڵەکە ویستن**: *[کنایه]* ١. کفر بوون؛ کارێک زۆر نائاسایی نەبوون بەڵام بە شتێکی ناڕەوا لە قەڵەم دانی ‹ئەو هەمووە تۆ دێر هاتووی و من هیچم نەگوتووە، جارێک من کەوتوومە دێر ئاسمان کوڵەکەی دەوێ!› ٢. کارێکی نائاسایی و سەیر ڕوو دان ‹وەڵا ئازاد بێ بۆ ئێرە، ئاسمان کوڵەکەی دەوێ› ☰ ١. آسمان به زمین آمدن ٢. محال بودن

**ئاسمانپێو** / asmanpêw/: ناو. ئوسترلاب؛ ئامرازێکی دەستی ئەستێرەناسان بووە بۆ لێکدانەوەی مەودای نێوان ئەستێرەکان ☰ أسطُرلاب

**ئاسمانە** / asmane/: ناو. ١. میچی بەرز ٢. مەلاشووی زار؛ ئاسمانەی دەم ☰ ١. سقف بلند ٢. سق

**ئاسمانی** / asmanî/: ناوەڵناو. عاسمانی: ١. شین؛ بە ڕەنگی ئاسمان ٢. پێوەندیدار بە ئاسمانەوە ☰ ١و٢. آسمانی

**ئاسمین** / asmîn/: ناو. یاسەمەنە؛ گوڵێکی ڕازێنەیی لە پارک و گوڵستانەکاندا هەیە،

گوڵەکانی سپی بەفری و عەترییە، قونجکی گوڵەکەی لوولەیی و درێژە، بە دار و دیوارەوە هەڵدەکشێت ⊠ یاسمن

**ئاسن** / asin/: ناو. ئاسن؛ ئاهەن؛ ئاسنگ؛ ئاهین؛ ئاهێن؛ هەسن؛ ئێسن؛ هەسنگ؛ هاسن؛ هێسن؛ توخمێ کیمیایی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ٢٦ و کێشی ئەتومی ٥٥,٨٤، زۆر زوو ژەنگ دێنێ و لە پیشەسازیدا زۆر بە کار دەڕوا ⊠ آهن

⊡ **ئاسنی سارد کوتان:** [کنایە] هەوڵی بێهوودە دان ⊠ سعی بی فایده کردن

**ئاسنبڕ** / asinbiř/: ناو. ئامرازێکی باریکەڵەی مشارئاسایە بۆ بڕینەوەی ئاسن ⊠ آهن‌بُر

**ئاسنجاو** / asincaw/: ناو. قاپ و قاچاغی مسین؛ دەفر و بەرۆشی لە مس چێکری ⊠ ظروف مسی

**ئاسندرک** / asindiř(i)k/: ناو. هەسندرک: ١. درکە ئاسنینە؛ تێلی وارشی درکدار ٢. سەرئاسنینە؛ پەملە؛ گزیلکەسەرە؛ چۆنەرلە؛ خەتکینە؛ زرەتاڵوو؛ قەمچیکەگیا؛ گیایەکە لە بنەماڵەی سەپانترێنە و تاڵوو، خونچەی گوڵەکەی خڕ و ڕەق و چەقڵدارە، شێوەی گەلا و لاسکی لە دڕووە زەردە و تاڵوو ڕەقە دەچێ بەلام دڕکاوییە ⊠ ١. سیم خاردار ٢. گل گندم خاردار

**ئاسنڕفێن** / asinř(i)fên/: ناو. ئاسن‌کێش؛ مەگەن؛ مەگنەتیک؛ کانزایەک کە ئاسن بەرەو خۆی ڕادەکێشێ ⊠ آهنرُبا

**ئاسنکێش** / asinkêş/: ☜ **ئاسنڕفێن**

**ئاسنگەر** / asinger/: ناو. ئاهینگەر؛ ئاهێنگەر؛ هەسنکەر؛ هەسنگەر؛ وەستاخاڵە؛ وەستای ئامرازی ئاسن ⊠ آهنگر

**ئاسنەڵان** / as(i)neɫan/: ناو. کانی ئاسن ⊠ معدن آهن

**ئاسنەواڵە** / as(i)newaɫe/: ناو. قوڕازە ئاسن؛ لەکارکەوتە و لەتوپەتی ئامرازی ئاسنی ⊠ آهن‌پاره

**ئاسنی** / as(i)nî/: ئاوەڵناو. ئاسنین؛ لە ئاسن چێکراو ⊠ آهنی

**ئاسنین** / as(i)nîn/: ئاوەڵناو. ١. ئاسنی؛ دروستکراو لە ئاسن ٢. قایم و بەهێز وەک ئاسن ⊠ ١و٢. آهنین

**ئاس‌وپاس** / as û pas/: ئاوەڵناو. ئاس‌وپەلاس؛ ڕووت‌وڕەجاڵ؛ ڕەش‌وڕووت ⊠ آس‌وپاس

**ئاس‌وپەلاس** / as û peɫas/: ☜ **ئاس‌وپاس**

**ئاسووار** / asuwar/: ئاوەڵناو. پاک؛ خاوێن؛ بێ‌خەوش ⊠ پاکیزه

**ئاسووە** / asuwe/: ☜ **ئاسوودە**

**ئاسوێنە** / aswêne/: ناو. سۆرانی؛ فەقێیانە ⊠ سرآستین بلند

**ئاسۆ** / aso/: ناو. هاسۆ؛ ئاسۆگ؛ ئاسوو: ١. کەنارەی ئاسمان؛ قەراغی ئاسمان ٢. تارمایی؛ ڕەشایی لە دوور ⊠ ١. افق ٢. شبح

**ئاسۆگ** / asog/: ☜ **ئاسۆ**

**ئاسۆگا** / asoga/: ناو. بەرچاوگە؛ وەرەچەم ⊠ چشم‌انداز

**ئاسوو** / asû/: ☜ **ئاسۆ**

**ئاسوودە** / asûde/: ئاوەڵناو. ئاسووە؛ ڕەحەت؛ بێ‌خەم ⊠ آسوده

⊡ **ئاسوودە بوون:** [کنایە] ڕەحەت بوون؛ ئاو هاتنەوە؛ کاژێر بوون (بۆ پیاو)؛ زاوێر بوون (بۆ ژن) ⊠ ارضا شدن

**ئاسوودەیی** / asûdeyî/: ناو. ڕەحەتی؛ بێ‌خەمی ⊠ آسودگی

**ئاسەڕ** / aseř/: ☜ **ئاستەڕ**

**ئاسەلا** / aseɫa/: ناو. ئاکام؛ سەرەنجە؛ بەرهەم ⊠ نتیجه

⊡ **ئاسەلا بوون:** بەرهەم هاتن (شوکر کوڕ خاسێکی لێ ئاسەلا بووگە!) ⊠ نتیجه شدن؛ حاصل شدن

**ئاسەوار / asewar**/: ناو. ١. شوێنەواری کەون ٢. پاشماوەی ڕەچەڵەک ‹هەی ئاسەوارتان ببڕێ!› ≋ ١. آثار ٢. بازماندگان یک نژاد

**ئاسەوان / asewan**/: ☚ **ئاشەوان**

**ئاسەی / asey**/: ☚ **ئاستەی**

**ئاسی / asî**/: ☚ **ئاسێ ـ١**

**ئاسیاو / asyaw**/: ناو. ئاساو؛ ئاشی ئاو ≋ آسیاب

◙ **ئاسیاو ئەسپێ**: ئاشێ کە بە وڵاخ دەگەڕێت ≋ آسیابی کە با استر می‌چرخد

**ئاسیاو بە نۆبە/ نۆرە**: نۆبە ـ نۆبە؛ بەبێ نۆرەبڕکێ ≋ آسیاب بە نوبت

**ئاسیاوان / asyawan**/: ☚ **ئاشەوان**

**ئاسیاوبازی / asyawbazî**/: ناو. ئاشەبەتەندوورە؛ گەمەیەکی منداڵانە ≋ از بازی‌های کودکان

**ئاسیاوگلێن / asyawg(i)lên**/: ☚ **ئاشگێڕ**

**ئاسیایی**[١] **/ asyayî**/: ناو. هەرکام لە خەڵکی سەر بە قوڕنەی ئاسیا و منداڵەکانیان ≋ آسیایی

**ئاسیایی**[٢]: ئاوەڵناو. پەیوەندیدار یان سەر بە ئاسیاوە ‹وڵاتانی ئاسیایی› ≋ آسیایی

**ئاسیدە / asîde**/: ناو. ١. هەڵوای بە دۆشاو؛ هەڵوای لە ئارد و ڕۆن و دۆشاو ٢. کووکوو؛ کووکی؛ خواردەمەنییەک لە تێکەڵی سەبزی، سێفەزەمینە، ئارد و هێلکەی لە ڕۆندا سوورەوەکراو ≋ ١. حلواشیرە ٢. کوکو

**ئاسیرە / asîre**/: ☚ **ئەستێرە**

**ئاسین / asîn**/: ناو. ئەنگوچک؛ قۆڵەکراس؛ سۆرانی؛ قۆڵەکەوا ≋ آستین

**ئاسیو / asîw**/: ناو. زیان؛ زەرەر؛ بەڵا؛ ئازار؛ تەگەرە؛ تەمەرە ≋ آسیب

**ئاسیوناسی / asîwnasî**/: ناو. ئازارناسی؛ زانیاری بەراوردی زەرەر و زیانێ کە لەش یان هەر تەن و پەیکەرێکی تر، لە زام، نەخۆشی یا هۆکارەی تر پێی دەگا ≋ آسیب‌شناسی

**ئاسێ / asê**/: ئاوەڵناو. ١. ئاسی؛ ئاسێهـ؛ ئاسێیە؛ سەخت و دژوار ‹ببێژن غەمزە ئەلماسێ، بە زەمزەم بینە شەهکاسێ/ کو حەل کت مەعنییێن ئاسێ، فَیا هَیّا لَنا هاتِ «مەلای جزیری»› ٢. هەڵەمووت؛ هەزار بە هەزار ‹چیاکە گەلەکی ئاسێیە› ≋ ١. دشوار ٢. دشوارگذر

**ئاسێرە / asêre**/: ☚ **ئەستێرە**

**ئاسێهـ**[١] **/ asêh**/: ناو. داروو کەی سنجووەتاڵە کە ئاگری زۆر بەتینە ≋ هیزم سنجد تلخ

**ئاسێهـ**[٢]: ئاوەڵناو. ئاسێ؛ سەخڵەت؛ سەخت و دژوار ≋ دشوار

**ئاسێیە / asêye**/: ☚ **ئاسێ ـ١**

**ئاش**[١] **/ aş**/: ناو. ١. ئاسیاو ‹ئاش بێ ئاشەوان ناگەڕێ «مەسەل»› ٢. دۆکلیو؛ دۆکولیو؛ چێشتی گیا و دۆ ٣. دەق؛ شۆی پارچە و یەخەکراس ٤. ئاشت؛ نێوانخۆش ≋ ١. آسیاب ٢. دوغبا ٣. آهار ۴. آشتی

◙ **ئاشی جندۆکان**: زڤرەک؛ گێژاو ≋ گرداب

**ئاشی کرێوە**: *[کینایە]* خێرایی لە کار ‹هێندە ئازا و بەدەستوبردە دەڵێی ئاشی کرێوەیە!› ≋ سرعت زیاد در کار

◙ **ئاش بە ڕمێن بوون**: *[مەجاز]* بازاڕ گەرم بوون ≋ گرمی بازار داشتن

**ئاش بە گۆپاڵ گێڕان**: *[مەجاز]* یەکجار توورە بوونی لەڕادەبەدەر ‹وەهای ڕق هەستابوو، ئاشی بە گۆپاڵ دەگێڕا!› ≋ بسیار عصبانی بودن

**ئاش بێ ئاو ئانەوە**: *[کینایە]* ئاو هەسەو کردن؛ کاری فێڕۆ کردن ≋ کار بیهودە کردن

**ئاش لە ئاو کەوتن**: *[کینایە]* ١. پەک کەوتن؛ هێز لە دەست دان ‹داخم ئەوەیە هاووەتەنم زۆری نەزانە/ بەم دەردەوە ئەتلێمەوە ئاو کەوتووە ئاشم «زێوەر»› ٢. دەنگ لێبڕان؛ وسکوت بوون ‹ماڵ چونکی هەراوهوریای کەم بووە/ هەر دەڵێی ئاشە و ئاوی کەوتووە «مەلا غەفوور»› ≋ ١. از کار افتادن

٢. ساکت شدن
**ئـاش نانـەوە**: ١. دامەزرانـدنی ئـاش ٢. *[کینایە]* ئاژاوە نانەوە؛ بشێوە دروست کردن ☰ ١. آسیاب درست کردن ٢. آشوب بەپا کردن
**ئاشی ئاور بوون**: *[مەجاز]* ئـازا و بـەکار بـوون؛ زۆر خێرا بوون ‹وەهـای دەماشـێتەوە دەڵـێی ئاشـی ئاورە› ☰ چالاک بودن
**ئاشی پێنگەڕان**: *[مـەجاز]* زۆر و زەوەنـد بـوون ‹میوانییـەکان دابـوو، گۆشـت و پـڵاو ئاشـی پێدەگەڕا!› ☰ آسیاب را چرخاندن
**وەک ئاش بوون**: *[کینایە]* زۆرخۆر بوون ‹تاژییەکانم زۆر باشن/ لە نان خواردن وەک ئاشن «هـەژار، *بـۆ کوردستان*»› ☰ پرخور بودن
**ئاش**[٢]: ☜ ئاشت
**ئاشـاخە**[١] / aşaxe/: نـاو. ئاشـاغە؛ لای خـواروو ☰ سمت پایین
**ئاشاخە**[٢]: ئاوەڵناو. ئاشاغە: ١. ڕزیو؛ قرپۆک (میـوە) ٢. بێبرەو و لە جەڵەبدا (ئاژەڵ) ٣. بێکارە؛ بە کار نەهاتوو ☰ ١. گندیدە (میوە) ٢. کمبها (دام) ٣. بُنجُل
**ئاشار** / aşar/: ناو. حاشـار؛ حەشـار؛ کـار و ڕەوتی وەشارتن ☰ عمل پنهان کردن
**ئاشـاردن** / aşardin/: چـاوگ. داشـاردن؛ حەشـار دان؛ شاردنەوە ☰ پنهان کردن
**ئاشاغە** / aşaǧe/: ☜ ئاشاخە
**ئاشانە** / aşane/: ناو. دەیەکی مـزاش کـە بەشـی خاوەن ئاشە و ئاشەوان دەیـداتێ ☰ مُزد صـاحب آسیاب
**ئاشبـەتاڵ**[١] / aşbetał/: نـاو. *[کینایـە]* دۆخـی هەڵوەشانەوە و بێ ئاکام بوون ☰ فروپاشی
**ئاشبەتاڵ**[٢]: ئاوەڵناو. *[کینایە]* ئاساوبەتاڵ؛ دەست لـە کار کێشاو ☰ دست از کار کشیده
◘ **ئاشبەتاڵ کردن**: ١. دەسـت لـە کـار کێشـان؛ چیتـر کـار نـەکردن ٢. پووچـەڵ کردنـەوە؛ هەڵوەشـاندنەوە ☰ ١. تعطیـل کـردن ٢. باطـل کردن
**ئاشبەتاڵ**[٣]: سارستە. قاو و هەرای ئاشەوان بۆ بانگ کردنی مشتەری (واتـا: ئـاش دانی نییـە و بێکـارە، گەنم و دانەوێڵەتان بێنن) ☰ عبـارت آسـیابان بـرای خواندن مشتری
**ئاشپەز** / aşpez/: نـاو. شـیوکەر؛ چێشـتکـەر؛ چێشتلێنەر ☰ آشپز
**ئاشـپەزخانە** / aşpezxane/: نــاو. کارخانـــە؛ هێشخانە؛ چێشتخانە؛ دەستان؛ متبەخ؛ مووبـەق؛ مدوەق؛ جێگەی چێشت لێنان ☰ آشپزخانە
**ئاشپەزی** / aşpezî/: نـاو. چێشـتکەری؛ کـاری چێشت لێنان و خۆراک ساز کردن ☰ آشپزی
**ئاشت** / aşt/: ئاوەڵناو. هاشت؛ ئاش؛ نێوانخۆش ☰ سازگار
◘ **ئاشت بونەوە**: ئاشـتی کـردن؛ خـۆش بوونـەوە؛ سازان؛ دڵەوە داین؛ دووس کردن ☰ آشتی کردن
**ئاشت کردنەوە**: ڕێکخستن و پێکهێنانەوەی دوو یان چەند کەس کە نێوانیان ناخۆش بووبـێ ☰ آشتی دادن
**ئاشتەبا** / aşteba/: ناو. ئەشتەبا؛ حاشتەبا؛ عاشـتەبا؛ شت؛ چت (زیـاتر لـە ڕسـتەی نەرێنیـدا دەگـوترێ) ‹هیچ ئاشتەبایەک شک نابەم!› ☰ چیز
**ئاشتی** / aştî/: ناو. نێوانخۆشی ☰ آشتی
**ئاشتیخواز** / aştîx(i)waz/: ئاوەڵناو. هێمنایەتیخواز؛ خوازیاری سازان و دوورگرتن لە شەڕ ☰ صلحطلب
**ئاشتێنی** / aştênî/: ناو. ئاشـتی؛ نێـوانخۆشـی ☰ آشتی
**ئاشچی** / aşçî/: ناو. شیوکەر؛ ئاشپەز ☰ آشپز
**ئاشخان** / aşxan/: ☜ ئاشخانە
**ئاشـخانە** / aşxane/: نـاو. ئاشـخان؛ چێشـتخانە؛ خواردنگـە؛ خوارنگـەھ؛ ڕسـتووورانت؛ شـوێنی دامەزراو بۆ خواردن و خواردنەوەی مشتەریان ☰

رستوران
**ئاشخۆری** / aşxorî/: ناو. ١. دەفری گەورەی ئاش تێکردن ٢. کاسەی شلەمەنی خواردن ■ آشخوری: ١. ظرف بزرگ ٢. کاسه
**ئاشدار** / aşdar/: ئاوەڵناو. ١. شۆدار؛ نمدار ٢. دەقدار؛ ئاهار لێ دراو ■ ١. مرطوب ٢. آهاردار
**ئاشدۆڵە** / aşdołe/: سارستە. زاراوەی گۆڕانی نۆبەتی ئاش ■ عبارت تعویض نوبت آسیاب
**ئاشرمە** / aşirme/: ☜ **ئاسرمە**
**ئاشڤان** / aşvan/: ☜ **ئاشەوان**
**ئاشق**[1] / aşiq/: ناو. ئاشک؛ دڵدار؛ ئەویندار؛ بەندەوار ‹لە وەسڵی تۆ زیاتر خەوفناکم، نەک لە هیجرانت/ بە میسلی شەمع و پروانە، بەڵێ ئاشق دەبێ وا بێ «نالی»› ■ عاشق
**ئاشق**[2]: ئاوەڵناو. دڵدار؛ ئەویندار؛ بەندەوار ‹ئاسییە ژیانی کەسی ئاشق› ■ عاشق
**ئاشقبەند** / aşiqbend/: ناو. سینەڕێز؛ ملوانکەی خشڵ پێوە هەڵواسراو ■ سینەریز
**ئاشقە** / aşqe/: ناو. لاولاو ■ نیلوفر
**ئاشک** / aş(i)k/: ناو. ١. ورگ؛ مەدە؛ عوور ٢. جیقەڵدان؛ جیقڵدان ٣. هێز؛ وزە؛ توانایی؛ تاقەت ٤. ☜ **ئاشق**[1] ■ ١. شکمبه ٢. چینەدان ٣. توان ٤. ☜ **ئاشق**[1]
**ئاشکار** / aşkar/: ☜ **ئاشکرا**
**ئاشکرا** / aşk(i)ra/: ئاوەڵناو. ئاشکار؛ خویا؛ دیار؛ بەرچاو ■ آشکار
⊡ **ئاشکرا بوون**: ١. دیاری دان؛ خویا بوون ٢. کەوتنە دەری وەشارتی؛ دەرکەوتنی نهێنی ■ ١. آشکار شدن ٢. فاش شدن
**ئاشکرا کردن**: پەنامەکی خستنە ڕوو؛ نهێنی دەرخستن ‹ئاشکرایی کرد هەموو ئەسرار و خۆی پەنهانە عەشق/ پڕ بە کاشانەی وجوودە، جانە یا جانانە عەشق «حەمدی ساحیبقەران»› ■ فاش کردن

**ئاشکراکراو** / aşk(i)rak(i)raw/: ئاوەڵناو. ڕاستافەکری؛ ڕاستکراوە ■ آشکارشده
**ئاشکرایی** / aşk(i)rayî/: ناو. خویایی؛ دیاردە ■ آشکاری
**ئاشگەڕێن** / aşgeřên/: ☜ **ئاشەوان ـ٢**
**ئاشگێڕ** / aşgêř/: ناو. ئاسیاوگلێن؛ ئەندازە ئاوێک ئاشی پێ دەگەڕێ ■ آب آسیاب گردان
**ئاشماڵ** / aşmał/: ئاوەڵناو. [مەجاز] ماستاوکەر؛ خولتەکەر ■ چاپلوس
**ئاشمای** / aşmay/: چاوگ. خواردنەوە؛ فڕ کردن؛ ڤەخوارن ■ آشامیدن
**ئاشمە** / aşme/: ☜ **هاشمە ـ٢**
**ئاشنا**[1] / aş(i)na/: ناو. دۆست؛ دۆس؛ هەوال؛ یار ‹هەتا تۆم ئاشنا بووی، ئاشنام بوون/ ئەمێستا موو بە مووم ئەغیارە بێ تۆ «نالی»› ■ آشنا
**ئاشنا**[2]: ئاوەڵناو. ناس؛ ناسیاو؛ شناس؛ ناسکری ‹هەتا تۆم ئاشنا بووی، ئاشنام بوون/ ئەمێستا موو بە مووم ئەغیارە بێ تۆ «نالی»› ■ آشنا
**ئاشنا و ڕۆشنا** / aş(i)na w řoşna/: ناو. دۆست و ناسیاو ■ در و آشنا
**ئاشنایەتی** / aşnayetî/: ناو. ناسیاوی؛ نێوانخۆشی ■ آشنایی
**ئاشنایی** / aşnayî/: ناو. ناسیاوی ■ آشنایی
**ئاشوژن** / aşujin/: ناو. گشتەکی جەواڵ دروون ■ رشتەی جوال‌دوزی
**ئاشوەستا** / aşwesta/: ناو. وەستای ئاش چاک کردن ■ أستادکار آسیاب
**ئاشویت** / aşwît/: ☜ **ئاشۆت**
**ئاشۆ** / aşo/: ناو. ١. وچان؛ پشوو؛ گت ٢. ☜ **ئاشوو** ٣. پشێوی و ئاژاوە ■ ١. وقفەی کوتاه ٢. ☜ **ئاشوو** ٣. آشوب و بلوا
**ئاشۆپاشۆ** / aşopaşo/: ئاوەڵناو. ١. تایبەتمەندی

قسەی شڕ و بێتام ٢. ئاشەوپاشە؛ پەرێشان و بێسەروبن (خەو) 🇮🇷 ١. یاوه ٢. آشفته (خواب)

**ئاشۆت** / aşot/: ناو. ئاشویت؛ ئاشووت؛ شاپە؛ ڕنی؛ ڕنوو؛ کلێلە؛ هەرەس؛ هەرەسە؛ کۆمایەکی گەورە لە بەفر کە لە بەرزاییەوە بەردەبێتەوە 🇮🇷 بهمن

**ئاشۆڕە** / aşoře/: ئاوەڵناو. هەڵوەدا؛ ئاوارە؛ بەڕیدە 🇮🇷 آواره

**ئاشو** / aşû/: ناو. ئاشۆ؛ کێم و زووخی برین 🇮🇷 چرک زخم

**ئاشوت** / aşût/: ☜ ئاشۆت

**ئاشەبەتەندوورە** / aşebetendûre/: ناو. ئاشەتەندوورە؛ گەمەیەکی منداڵان 🇮🇷 از بازی‌های کودکانه

**ئاشەتەندوورە** / aşetendûre/: ناو. ١. ☜ ئاشەبەتەندوورە ٢. گێژاو؛ سووڕی ئاوی گۆمی قووڵ ٣. ئاشێکی دۆڵەکەی بە قسڵ و بەرد ئەکەن تا بە ئاوی کەمیش بگەڕێ 🇮🇷 ١. ☜ ئاشەبەتەندوورە ٢. گرداب ٣. نوعی آسیاب آبی

**ئاشەف** / aşef/: ☜ ئاشەڤ

**ئاشەڤ** / aşev/: ئاوەڵناو. ئاشەف؛ پەشۆکاو؛ شێواو 🇮🇷 پریشان

**ئاشەڤان** / aşevan/: ☜ ئاشەوان

**ئاشەقوڵانێ** / aşequłanê/: ناو. گەمەیەکی منالانەیە 🇮🇷 نوعی بازی کودکان

**ئاشەکڵە** / aşek(i)łe/: ئاوەڵناو. ئاژاوەگێڕ؛ شۆفار؛ گێرەشێوێن 🇮🇷 سخن‌چین

**ئاشەگوێرێژ** / aşeg(i)wêrêj/: ناو. *[باوەڕی کۆن]* شتێکی خەیاڵییە، وەک دێو و درنج، منداڵی پێ دەترسێنن 🇮🇷 لولو

**ئاشەوان** / aşewan/: ناو. ئاسەوان؛ ئاسیاوان؛ ئاشڤان؛ ئاشەڤان: ١. خاوەناش؛ میراش؛ قەڕاش؛ خاوەنی ئاسیاو ٢. ئاش گەڕێن؛ ئاردهەڕ؛ بهەڕ؛ لونیە؛ لوونیە؛ لوونە؛ مەکینەچی؛ کاریگەری ئاسیاو 🇮🇷 ١و٢. آسیابان

**ئاشەوپاشە** / aşewpaşe/: ☜ ئاشۆپاشۆ ـ٢

**ئاشی** / aşî/: ناو. لاسایی کوێرانە و بێسەرنج دان 🇮🇷 تقلید کورکورانه

**ئاشیت** / aşît/: ناو. بەلا؛ ئاپور 🇮🇷 آفت

**ئاشیرەت** / aşîret/: ناو. ئاشیرە؛ هێما؛ ئاماژە؛ نیشانک 🇮🇷 اشاره

**ئاشین**[1] / aşîn/: چاوگ. ئاخ هەڵکێشان 🇮🇷 آه سر دادن

**ئاشین**[2]: ناو. قونێر؛ دمەڵ؛ دومەڵ؛ کوان 🇮🇷 دُمل

**ئاشێ** / aşê/: ناو. ئاشێو؛ ئاسێ؛ دەرد و کوێرەوەری 🇮🇷 سختی

**ئاشێرە** / aşêre/: ☜ ئاشیرەت

**ئاشێڕ** / aşêř/: ناو. کەسێ کە باراش دەبا بۆ ئاش ‹شین بووی لە زەوی، پێدەگەی و دەتهێڕێ/ ئاشێڕە خودا و ئاشەکەشی گەردوونە «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› 🇮🇷 باربرِ آسیاب

**ئاشێف** / aşêf/: ☜ ئاشێڤ

**ئاشێڤ** / aşêv/: ناو. ئاشێف: ١. کار و ڕەوتی بنکۆڵ کردنی سەوزەوات بۆ بەهێز بوونی ٢. پەشێوی؛ شەوشی؛ شێواوی؛ پەرێشانی 🇮🇷 ١. تکمیش ٢. پریشانی

**ئاشێگە** / aşêge/: ناو. زەوی سەخت و ڕەقەن 🇮🇷 زمین سخت

**ئاشێو** / aşêw/: ناو. ١. ئاشێ؛ کارەسات؛ چۆرتم؛ دەرد و بەلا و بەسەرهاتی خراپ ٢. ئاژاولە؛ ئاژاوە؛ بشێوی 🇮🇷 ١. مُصیبت ٢. آشوب

**ئاغا** / ağa/: ناو. ئاخا؛ ئاغە: ١. گەورە؛ سەروەر ٢. نازناوێکە لە پێش یا بە دوای ناوی خاوەن مولک و سەرۆک هۆزەکانەوە دێت ‹باپیر ئاغای مەنگوڕ؛ حەمە ئاغای کۆیە؛ ئاغا حەسەنی یازیبلاغی› ٣. ئەرباب؛ نازناوێکە بۆ ڕێز نان لە دەوڵەمەندان و گەورە پیاوان ‹پیاو کەسێکە بۆ ژیان و جیفە تا ئاخر

نەفەس/ نۆکەری شێخ و غولامی بەگلەر و ئاغا نەبێ «موفتی پێنجوێنی»› ٤. داشەهارە؛ دواداشی دامە، کە دەتوانێ بە هەموو لایەکدا بڕوا ☰ ١. بزرگ، سرور ٢. آقا ٣. ارباب ۴. آقای بازی داما

▣ **ئاغای کەس نەکێڵ و بەردەرمەقان:** /پلار/ ئاغای ڕووتی نەدار ☰ ارباب مُفلس

▣ **ئاغا بەڵێ کردن:** /پلار/ چاک و خراپ پەسند کردن لە ترسان ☰ اطاعت محض کردن

**ئاغا بە نۆکەر نەگرتن:** /کنایە/ بێ‌منەت بوون و کەس پێ لە خۆ زل‌تر نەزانین ‹ئاغاش بە نۆکەر ناگری/ وەک من لە داخا نامری «هێمن»› ☰ ...

**ئاغا و کوێخای خۆ بوون:** /کنایە/ سەربەخۆ بوون و ژێر دەستی کەس نەبوون ☰ ارباب خود و نوکر خود بودن

**ئاغابانو** / ağabanû/: ☜ ئاغەبانو

**ئاغابانی** / ağabanî/: ☜ ئاغەبانو

**ئاغاتی** / ağatî/: ناو. گەورەیی؛ بەڕێزی ☰ آقایی

**ئاغادێ** / ağadê/: ناو. ئەرباب؛ ئەرواو ☰ ارباب

**ئاغاژن** / ağajin/: ناو. ژنی ئاغا ☰ همسر ارباب

**ئاغایانە**[1] / ağayane/: ناو. بەشی ئاغا لە داهاتی ڕەعیەت ☰ سهم اربابی

**ئاغایانە**[2]: ناوەڵناو. تایبەت بە ئاغا ‹کڵاوی ئاغایانە› ☰ ویژەی آقا

**ئاغایانە**[3]: ناوەڵکار. وەک ئاغا؛ بە شێوەی ئاغا ‹ئاغایانە دەهات و دەڕۆیشت› ☰ آقایانە

**ئاغایەتی** / ağayetî/: ناو. ١. ئاغاتی؛ گەورەیی؛ مەزنایەتی ٢. موڵکداری؛ بەگایەتی؛ دەربەگایەتی ☰ ١. آقایی؛ سروری ٢. ارباب رعیتی

**ئاغزوونە** / ağzûne/: ناو. ئاخزوونە؛ بەرازە؛ ئاڵقەی ددانەداری کانزا کە زمانەی تێدایە و بۆ داخستنی قایش و کەوش و بەرەزین و ... بە کار دەچێ ☰ سگک

**ئاغزە** / ağze/: ناو. ئەغزە؛ قونچکە سیغار؛ بنکی جغارە؛ کاغەزێکە دەیپێچن و دەیخەنە بنی قامیشە سیغارەوە ☰ فیلتر سیگار

**ئاغزەجگەرە** / ağzec(i)gere/: ناو. قونچک؛ بنک ☰ فیلتر سیگار

**ئاغستۆس** / ağistos/: ناو. هاڤینا پاشین؛ مانگی ئووت ☰ ماه اوت

**ئاغلەویک** / ağlewîk/: ☜ ئاغڵەویك

**ئاغلیک** / ağlîk/: ☜ ئاغڵەویك

**ئاغڵەویک** / ağłewîk/: ناو. ئاخلەویک؛ ئاخڵەویک؛ ئاخڵەوێک؛ ئاخلیڤینک؛ ئاغلەویک؛ ئاغلیک؛ تاوە ☰ تابە

**ئاغە** / ağe/: ناو. ئاغا ☰ آقا

**ئاغەباجی** / ağebacî/: ناوەڵناو. سەرژنانیلە؛ بەلەکناچێ ☰ زن‌نما

**ئاغەبانو** / ağebanû/: ناو. ئاغابانوو؛ ئاغابانی؛ ئاخەبانوو؛ پارچەیەکی سەرپێچی پیاوان ☰ نوعی پارچەی دستار مردانە

**ئاغەبرا** / ağeb(i)ra/: ناو. ئابرا؛ کاکە؛ برا؛ برالە ☰ داداش

**ئاغەجەواش** / ağecewaş/: ☜ ئاخچەباش

**ئاغەڵ** / ağeł/: ناو. غەڵ؛ ئاغەڵەمەڕ؛ هۆڵ؛ گەوڕ؛ پاگە؛ تەوێڵە؛ جێی داگرتنی مەڕ و بزن لە دەمی سەرمادا ☰ آغُل

**ئاغەڵان** / ağełan/: ناو. هەوارگە ☰ ییلاق

**ئاغەڵەمەڕ** / ağełemeř/: ☜ ئاغەڵ

**ئافات** / afat/: ناو. دەرد؛ ئازار؛ بەڵا و پەتا ‹تاقانە یەتیمی خەڵەفی ئاخری نیسان/ تۆ خۆش بی سەدەف بوو بە فیدات دوور بی لە ئافات «نالی»› ☰ آفات

**ئافاندن** / afandin/: چاوگ. تاواندنەوە؛ ئاتیواندن ☰ ذوب کردن

**ئافتا** / afta/: ناو. هاوتا؛ ئامتا؛ هامتا؛ هەمبەر ‹ئەگەر چاوی خۆم بە یایە زینێ هەڵدێنایە/ وەهام دەدی ئافتای کاکە مەمێ جوانە «بەیتی مەم و زین»›

🇮🇷 همتا

**ئافتاو** / aftaw/: ناو. ئەفتەو؛ خۆر؛ خوەر؛ خۆرەتاو؛ خوەرتاو؛ ڕۆژ 🇮🇷 آفتاب

**ئافتاوگەردان** / aftawgerdan/: ناو. پێشەسەرێکە درویێنەوان لە توێڵیان دەبەستن تا تاو لە چاویان نەدا 🇮🇷 سایەبان کلاه دروگران

**ئافتاوە** / aftawe/: ناو. مسینە؛ مسینک؛ لوولێنە؛ مەعدەنی 🇮🇷 آفتابه

⊡ **ئافتاوە بۆ کەسێک هەڵگرتن:** مەرایی کردن؛ ڕیایی کردن و خۆ شیرین کردن بۆ کەسێک 🇮🇷 به کسی تملق کردن

**ئافتاوە بە کەسێک هەڵنەگرتن:** پێ هیچ بوون و بە کەم گرتن 🇮🇷 کسی را به هیچ شمُردن

**ئافتاوەدار** / aftawedar/: ناو. خزمەتکاری تەرخان‌کراوی دیوەخان بۆ هەڵگرتنی ئافتاوەی میوانان و ئاو بە دەستدا کردن 🇮🇷 آفتابه‌چی

**ئافتوش** / aftuş/: ناو. کاری خۆ تێهەڵقورتاندن 🇮🇷 دخالت (نابجا)

**ئافر** / afir/: ☜ **ئاخوڕ**

**ئافراز** / afraz/: ☜ **هەوراز**

**ئافران** / af(i)ran/: چاوگ. بەدیهاتن؛ چێ بوون؛ درووس بوون؛ هاتنە دی 🇮🇷 آفریده شدن

**ئافراندن** / af(i)randin/: چاوگ. عافراندن؛ درووس کردن؛ بەدیهێنان؛ خولقاندن 🇮🇷 آفریدن

**ئافراو** / af(i)raw/: ناو. ئافەریدە؛ خولقاو؛ درووست کراو 🇮🇷 آفریده

**ئافرەت** / afret/: ناو. عافرەت؛ ژن؛ ژەنی 🇮🇷 زن

**ئافرێنەر** / af(i)rêner/: ناو. چێکەر؛ درووستکەر 🇮🇷 آفریننده

**ئافڕ** / afiř/: ناو. ١. ئاخوڕ؛ جێ خۆراکی ئاژەڵ ‹دوو هەسپ لە سەر ئافڕەکی نابە «پەند»› ٢. ئاوخۆرگە؛ دەراڤ؛ جێگەی ئاو خواردنی ئاژەڵ ٣. ژەک؛ فرشک؛ فرچک؛ شیری چەور و خەستی گوان، چەن ڕۆژ پێش و پاش زایین 🇮🇷 ١. آخور ٢. آبشخور ٣. آغوز

**ئافڕتین** / afiřtîn/: چاوگ. ئاو ڕشتن؛ ئاو ڕژاندن 🇮🇷 آب ریختن

**ئافڕێ** / af(i)řê/: ☜ **ئافڕێ**

**ئافزیل** / afzîl/: ☜ **ئاڤزێڵ**

**ئافشوژن** / afşûjin/: ناو. گشتەکە بەنی تێڕ و جەوالدروون 🇮🇷 نخ جوالدوزی

**ئافگیر** / afgîr/: ناو. زەناو؛ گۆل 🇮🇷 آبگیر

**ئافور** / afur/: ناو. ژڤر؛ گاکێوی 🇮🇷 گوزن

**ئافەت** / afet/: ناو. مێمل؛ بەلا؛ وەی 🇮🇷 آفت

**ئافەتە** / afete/: ناو. بلفەتە؛ لارەشە؛ چاوقوولکە؛ تاعوون 🇮🇷 طاعون

**ئافەرەم** / aferem/: دەنگ. ئافەرین؛ ئافەریم؛ هۆپ؛ هەلالتە؛ بترژم؛ بارەقەڵلا؛ ئافەکەڵلا؛ وتەی پەسند کردن و دەسخۆشی گوتن 🇮🇷 آفرین

**ئافەریدە** / aferîde/: ناو. ئافراو؛ درووستکراو؛ خولقاو؛ ڕسکاو؛ وەدیهاتوو؛ داهێنراو 🇮🇷 آفریده

**ئافەریم** / aferîm/: ☜ **ئافەرەم**

**ئافەرین** / aferîn/: ☜ **ئافەرەم**

**ئافیدە** / afîde/: ناوەڵناو. پاقژ؛ پاک؛ تەمیس؛ خاوێن 🇮🇷 تمیز

**ئاڤ** / av/: ناو. ئاو 🇮🇷 آب

⊡ **ئاڤا بەرف:** بەفراو؛ سەهۆلاو 🇮🇷 برفاب

**ئاڤا ڕەش:** ئاوی ڕەش؛ ئەوسێ؛ جۆرێک نەخۆشی چاوە، ئێش و کەم بوونەوەی سۆمای دەگەڵە و ئەگەر دەرمان نەکرێ، کوێر دەکا 🇮🇷 آب سیاه

**ئاڤا** / ava/: ناوەڵناو. ئاوا؛ ئاوەدان 🇮🇷 آباد

**ئاڤاتەزی** / avatezî/: ناو. ئاوی زۆر سارد 🇮🇷 آب سرد

**ئاڤار** / avar/: ناو. چەرم؛ خام 🇮🇷 چرم

**ئاڤارە** / avare/: ناوەڵناو. ١. ☜ **ئاوارە** ٢.

گوڵچن؛ کۆکەرەوەی گوڵەگەنم لە جاڕدا ☰ ۱. ☚ **ئاوارە** ۲. خوشەچین

**ئاڤاڕ** / avař/: ناو. کەوڵ و پێستەی ئاژەڵ بەر لە دەباغی ☰ پوست دباغی نشده

**ئاڤاڕو** / avařû/: ☚ **ئابڕو**

**ئاڤاڕێ** / avařê/: ئاوەڵناو. گومڕا؛ لە ڕێ لادەر؛ لە ڕێ دەرچووگ ☰ گُمراه

**ئاڤاگەر** / avager/: ئاوەڵناو. ئابادکەرەوە؛ ئاوەدانکەر ☰ آبادگر

**ئاڤاندن** / avandin/: چاوگ. ئاواندن؛ ئاتیواندن؛ قاڵ کردن؛ تاواندنەوە ☰ ذوب کردن

**ئاڤانی** / avanî/: ناو. ۱. ئاوەنیا؛ ڕەپستە؛ زەوی و زاری هەموو کاری تێدا کراوی لە بەهرە دان ۲. ئابادی؛ ئاوەدانی ☰ ۱. آبسته ۲. آبادانی

**ئاڤاهی**[1] / avahî/: ناو. ۱. گوند؛ دێ؛ ئاوایی؛ ئابادی ۲. ماڵ؛ خانووبەرە؛ خانوو ☰ ۱. آبادی ۲. خانه

**ئاڤاهی**[2]: ئاوەڵکار. وەها؛ بەم جۆرە؛ ئاواینە ☰ این‌طور

**ئاڤاهیساز** / avahîsaz/: ناو. نژیارڤان ☰ معمار

**ئاڤبڕ** / avbiř/: ☚ **ئاوبڕ**

**ئاڤپەنگ** / avpeng/: ناو. ئەو قووڵکە یان ئەو بەردە قووڵەی ئاوی بارانی تێدا ڕادەوەستێ ☰ جای جمع شدن آب باران

**ئاڤپیڤاز** / avpîvaz/: ناو. پیوازاو؛ پیازاو؛ چێشتی ڕۆن و پیواز و ئاو ☰ سوپ پیاز

**ئاڤچزک** / avçizik/: ناو. فوارە ☰ فوّاره

**ئاڤخێز** / avxêz/: ناو. ۱. ئاوێ کە بە مەندی و لەسەرخۆ بڕوا ۲. جێگای کۆ بوونەوەی ئاوی جۆگە و ڕووباری هەر هەرێمێ ۳. جۆگەلەیەک بنەکەی زیخ بێ ☰ ۱و۲. آبخیز ۳. جوی با کف سنگریزه

**ئاڤدانک** / avdanik/: ناو. ئاوخۆری؛ دەفری ئاو ☰ آبخوری

**ئاڤدڕ** / avdiř/: ☚ **ئاودڕ**

**ئاڤدڕکە** / avdiřke/: ☚ **ئاودڕ**

**ئاڤدۆنگ** / avdong/: ناو. ۱. *[پلار]* تەڕەتووڕکاو؛ شۆربای بێ ڕۆن و ناخۆش ۲. ئاڤرێژ؛ جێ مێز؛ شوێنی میز کردن ☰ ۱. آب زیپو ۲. آبریزگاه

**ئاڤدەست**[1] / avdest/: ناو. ئابخانە؛ ئاودەست؛ ئاودەستخانە ☰ مُستراح

**ئاڤدەست**[2]: ئاوەڵناو. دەسپاک؛ ئەمین؛ جێ‌باوەڕ ‹مخابن، بەرپرسا مە ئاڤدەست نینە!› ☰ درستکار

**ئاڤدەڤ** / avdev/: ناو. قومقومە؛ مەتارەی ئاو ☰ قُمقُمه

**ئاڤدەل** / avdel/: ناو. نێرە پۆڕ ☰ دُرّاج نر

**ئاڤدەیی** / avdeyî/: ناو. قەرەوی؛ قەرەبوو ☰ جُبران

**ئاڤدین** / avdîn/: ناو. چێرە؛ قەرەبوو؛ کاری لە حەق هاتن ☰ تلافی

**ئاڤدێر** / avdêr/: ناو. ئاودێر؛ کەسێ کاری ئاودانی مەزرایە ☰ آبیار

**ئاڤر** / avir/: ناو. ۱. تەشتی تێدا خواردنەوەی ئاژەڵ ۲. ئاور؛ ئاگر ☰ ۱. تشت آبخوری چارپایان ۲. آتش

**ئاڤراز** / avraz/: ☚ **هەوراز**

**ئاڤرمیش** / avirmîş/: ☚ **هەورێشم**

**ئاڤریل** / avrîl/: ☚ **ئاوریل**

**ئاڤرێژ** / avrêj/: ☚ **ئاڤدۆنگ ـ۲**

**ئاڤرێژگە** / avrêjge/: ناو. ڕائاو؛ ئاوەڕۆ؛ ڕەهەند؛ ژێراوی ئاوی پیس ☰ فاضلاب

**ئاڤڕو** / avřû/: ☚ **ئابڕو**

**ئاڤڕێ** / avřê/: ئاوەڵناو. ئاڤرێ؛ لاڕێ؛ لادەر لە ڕێگە ☰ مُنحرف

**ئاڤڕێژ** / avřêj/: ناو. ۱. کناراو؛ ئاودەس؛ ئاودەسخانە ۲. ئاورێژ؛ ڕێژاو؛ تاڤگە ☰ ۱. مُستراح ۲. آبشار

**ئاڤزونک** / avzûnik/: ناو. ئەڵقەزوومە ☰ سگک

**ئاڤزەلەک** / avzelelik/: ناو. گێلاس ☰ گیلاس

**ئاڤزەلێلک** / avzelêlik/: ناو. ئیسقایی؛ نەخۆشی ئاوبەند ☰ استسقا

**ئاڤزەمکی** / avzemkî/: ئاوەڵناو. درەنگ‌ڕەس ☰ دیررس

**ئاڤزی** / av(i)zî/: ☜ **ئاوسی**

**ئاڤزیل** / avzîl/: ☜ **ئاڤزێڵ**

**ئاڤزین** / avzîn/: ناو. بڵندایی و گێژی نێرینەی ئاو ‹ئاڤزینێ خولیاکەی ئەسپێکە سپی‌بۆر/ ئارامی: سمکۆڵە و کورژنی: هێوری و دووریتی: نزیک و قیبلەکەی: خاک‌وخۆڵ «شێرکۆ بێکەس»› ☰ خیزاب؛ کوهەی آب

**ئاڤزێ** / avzê/: ناو. زەناو؛ ئاوەزێ؛ زۆنگ ☰ باتلاق

**ئاڤزێل** / avzêl/: ☜ **ئاڤزێڵ**

**ئاڤزێڵ** / avzêł/: ناو. ئاڤزیل؛ ئاڤزێل؛ ئافزیل؛ هەسێڵ؛ ئەستێر ☰ استخر

**ئاڤزێم** / avzêm/: ناو. کوێرەکانی؛ کانی و سەرچاوەیەک کە هاوینان وشک دەکا ☰ چشمەی فصلی

**ئاڤژەن** / avjen/: ناو. ١. مەلەوان؛ سۆبایی‌کەر ٢. سەوڵی بەلەمەوانی ☰ ١. شناگر ٢. پاروی قایقرانی

**ئاڤژەنی** / avjenî/: ناو. مەلەوانی؛ سۆبایی ☰ شناگری

**ئاڤس** / avis/: ☜ **ئاوس**

**ئاڤسارک** / avsar(i)k/: ناو. زاخۆن؛ مەسنا؛ سارداو ☰ سردابه

**ئاڤساندن** / avsandin/: ☜ **ئاوساندن**

**ئاڤسین** / avsîn/: چاوگ. ١. دووگیان بوون؛ زک‌پڕ بوون ٢. ئەستوور بوون و هەڵامسان ٣. فام کرن؛ تێگەیشتن ☰ ١. آبستن شدن ٢. آماسیدن ٣. فهمیدن

**ئاڤسینگ** / avsîng/: ناو. فرک؛ سینەپاڵوو؛ ژان و پەنەمانی سیپەلاک لە سەرماوە ☰ سینه‌پهلو

**ئاڤشۆ** / avşo/: ناو. چڵکاو؛ ئاوی شت پێ شۆراو ☰ پساب

**ئاڤشۆرک** / avşorik/: ناو. [پەلار] خۆراکی فەقیرانەی ناخۆش ☰ غذای فقیرانه‌ی نامطبوع

**ئاڤشیز** / avşîz/: ناو. ئاوی لیخن و پڕ لم و لیتە ☰ آب گل‌آلود

**ئاڤشیلە** / avşîle/: ناو. ئاوقۆرە؛ گوشراوی بەرسیلە ☰ آبغوره

**ئاڤک** / avik/: ناو. شۆرباو؛ گێرمە ☰ شوربا

**ئاڤکمادک** / avikmadik/: ناو. ئاوگۆشت؛ یەخنی؛ گۆشتاو ☰ آبگوشت

**ئاڤکینە** / avkîne/: ناو. تۆونگەی لوولەداری لە شیشە ☰ تُنگ بلوری

**ئاڤکێش** / avkêş/: ☜ **ئاوکێش**

**ئاڤگیر** / avgîr/: ناو. قۆرت و قوولکەیێ ئاوی باران ڕادەگرێ ☰ جای جمع شدن آب باران

**ئاڤلاک** / avlak/: ناو. نێچیرگە؛ دەڤەرێ کە لە نێچیر پڕە ☰ شکارگاه

**ئاڤلاما** / avlama/: ناو. کار و ڕەوتی ڕاو کردن؛ سەید کردن ☰ عمل صید کردن

**ئاڤلدانک** / avildan(i)k/: ناو. مندالان؛ تۆڵدان؛ پزدان ☰ رحِم

**ئاڤلک** / avlik/: ناو. ئاڤلەک؛ بلۆق؛ تۆقڵەی سەر پێستی دەست و پێ ☰ تاول

**ئاڤلە** / avle/: ☜ **هاوڵە ـ١**

**ئاڤلەک** / avlek/: ☜ **ئاڤلک**

**ئاڤنتە** / avinte/: ناو. ئامانێ ئاڤێ؛ دەفری ئاو ☰ ظرف آب

**ئاڤنێم** / avnêm/: ناو. کێم؛ زووخ؛ خوێناو یان زەرداوی برین ☰ خونابه

**ئاڤور** / avur/: ناو. حەچەکێفی؛ نێرییە کێوی ☰ تکەی کوهی

**ئاڤۆ** / avo/: ناو. فرمێسک؛ ئەسرین ☰ اشک

**ئـاڤۆک** / avok/: نـاو. کوولەکـــە؛ کـــوودی ☰ کدوحلوایی

**ئاڤـەرێس** / averês/: نـاو. ئاوریشـــمی خــــاو؛ هاوریشمی هێشتا نەڕێسراو ☰ ابریشم خام

**ئـاڤی**[١] / avî/: نـاو. ١. شـەونم؛ ئاونـگ؛ خونـاو ٢. ئاوی/ شینی کاڵ ☰ ١. شبنم ٢. آبی آسمانی

**ئاڤی**[٢]: ئاوەڵناو. ١. ئاوی؛ بەراو؛ بەرانبەری دێمی ٢. هەڵـــوەدا؛ ئـــاوارە ٣. ئـــاوژی؛ تایبەتمەنـــدی گیانەوەرێ کە لە ئاودا دەژی ٤. ئاوی؛ بە ڕەنگـی ئاسمان ☰ ١. آبی (مزرعـه) ٢. آواره ٣. آبـزی ۴. بـه رنگ آبی آسمانی

**ئاڤیاری** / avyarî/: نـاو. ١. کۆمـەگ؛ یارمـەتی ٢. ئاودێری؛ ئاویاری ☰ ١. همیاری ٢. آبیاری

**ئاڤیتن** / avîtin/: ☜ **هاویشتن**

**ئاڤیر** / avîr/: نـاو. تەشتی ئاو خواردنەوەی ئـاژەڵ ☰ تشت آبخوری دام

**ئاڤیزەر** / avîzar/: ناو. خمخمۆک؛ کەشتیلەسەرە؛ جۆرێ مارمیلکەیە خۆی بـە ڕەنگـی دەوروبـەری دەردێنێ ☰ آفتاب‌پرست

**ئاڤیژە** / avîje/: ئاوەڵناو. پاک؛ خاوێن ☰ پاک

**ئاڤینک** / avînik/: ناو. شەونم؛ خوناڤ؛ ئاونـگ ☰ شبنم

**ئاڤێ** / avê/: ناو. ئاونگ؛ خوناو؛ شەونم ☰ شبنم

**ئاڤێتن** / avêtin/: ☜ **هاویشتن**

**ئاڤێر** / avêr/: ناو. عیددە؛ وچانی تەڵاقـدراو یـان مێرد مردوو ☰ عدّەی زن

**ـئاڤێژ** / avêj-/: پاشەوشە. فڕێدەر؛ تووڕدەر؛ ـهاوێژ ‹کەڤرئاڤێژ› ☰ ـ انداز

**ئاڤێستا** / avêsta/: نـاو. ئەوێســـتا؛ کتـــێبی زەردەشت ☰ اوِستا

**ئاقار** / aqar/: ناو. ١. شوێن؛ جێگە ٢. دەوروبـەر ‹بە ئاهم گەر ڕەقیبانت بسووتێن، ئەی گوڵی ڕەعنـا!/ مەڕەنجە! تۆ و خودا، شوعلە لە ئاقاری چقڵ چی بکا؟ «مەحوی»› ٣. مەڵبەند و ناوچە ‹ساڵێ ماڵمان لەو ئاقارە بـوو› ٤. دارسـتان؛ زەوینـێ کـە داری لـێ چەقابێ ٥. ئاست؛ حانـد؛ بەرانبـەر ‹گـوللە تـۆپ وەک تۆپی قایش بوو لە ئاقار غیرەتی/ تەبعی جۆیـای بەزمی شێلگ بوو، لە جێی سینەی کەمان! «سالم»› ☰ ١. جا ٢. پیرامـون ٣. منطقـه ۴. زمـین مُشـجر ۵. مُقابل

**ئاقاق** / aqaq/: ☜ **ئاقاقیا**

**ئاقاقیا** / aqaq(i)ya/: ناو. ئەقاقی؛ ئاقاق؛ عـەناوە؛ دار بیســمیللا؛ دار جـەوی؛ ئـەکاکی؛ دار دەرزی؛ دارێکی ڕازێنەیی ئەمریکای بـاکوورە بـە وردیلـە گەڵای هێلکەیی شینی کاڵ، گوڵی بە هێشـووی سپی یـان بنەوشـی بۆنخـۆش و چێـوی پتـەوی زەردەوە ☰ اقاقیا

**ئاقد** / aqid/: ناو. گومەز؛ گومبەز ☰ گنبد

**ئاقشـقە** / aqişqe/: نـاو. دوودەری؛ پەنجـــەرەی دوودەری؛ پەنجەرەیـــەک کـــە لـــە ناوەڕاســـتا دەکرێتەوە ☰ پنجرەی دولنگه

**ئاقڵ** / aqił/: ئاوەڵـناو. ژیر؛ فامیدە؛ هیر؛ ژیرمەنـد؛ بە ئـاوەز؛ مژیـوەر؛ ئاوەزمەنـد؛ ژیـرەک؛ ژیرلـێ؛ ژیــربیر؛ کــەوێر؛ عــاقڵ؛ مامۆتــک؛ چەکەسـوو؛ زەینساخ و لێهاتوو لە درووسـت بـیر کردنـەوەدا ‹شێر کە هات، گیرۆدە بوو، سەد نەعرەتە و ناڵەی بـە هیچ!/ ئاقڵێ گوێ لێ نەکەن، فیکری دووسەدساڵەی بە هیچ! «قانع»› ☰ عاقل

⊡ **ئاقڵ کردن**: *[کینایە]* تەمبێ کـردن ‹وەهـام ئـاقڵ کردووە تازە بەو گەڕەکەدا نایەت› ☰ تنبیه کردن

**ئاقڵانە** / aq(i)łane/: ئاوەڵناو. ژیرانە ☰ عاقلانه

**ئاقڵسوک** / aqiłsûk/: ☜ **ئەقڵسوک**

**ئاقۆ** / aqo/: ناو. ئـاقوو؛ حـاقوو؛ جـۆرێ کـۆتر ☰ نوعی کبوتر

**ئاقوو** / aqû/: ☜ **ئاقۆ**

**ئاقووت** / aqût/: ناو. ئاقوویت؛ یـاقووت؛ بـەردێکی بەنرخە، زۆرتر بە ڕەنگی سووری گەش 🇮🇷 یاقوت

**ئاقوویت** / aqûyt/: ☜ **ئاقووت**

**ئاقیت** / aqît/: ☜ **ئاقید**

**ئاقید** / aqîd/: نـاو. ئاقیت؛ دمسی تـیر؛ دۆشـاوی خەست 🇮🇷 شیرەی غلیظ

**ئاقیق** / aqîq/: نـاو. ئەقیق؛ یاقیق؛ گەوهەرێکە بـە زۆر ڕەنگان دەبێ 🇮🇷 عقیق

**ئاقیله** / aqîle/: ناو. ئامورر؛ ئارەق؛ یارەق؛ ئاکیـل؛ ئاکیلــە؛ باســکێش؛ باســکەمژانە؛ بەشــێ لــە کەرەسەی جووت 🇮🇷 بخشی از خیش

**ئاقیله و ماقیله** / aqîlewmaqîle/: نـاو. ئـاموور و نیر؛ یارەق و نێل؛ ئاکیله و ماکیله؛ ئاراڤ 🇮🇷 خیش و مُتعلّقات آن

**ئاک** / ak/: ناو.ئاو. ئاکبەنـد؛ دەس‌نـەخواردوو: ۱. بەستەبەندی کـراوی کارخانـە ‹ئـەم تەلەڤـیزیۆنەم کاتێ کڕی ئاک بوو› ۲. *[مەجاز]* نـوێی لەکارنـەکراو ‹تەلەڤیزیۆنی ئاک› 🇮🇷 ۱و۲. اکبند

**ئاکادێمی** / akadêmî/: نـاو. ئاکادێمیـا: ۱. کـۆڕی زانیاری ۲. فێرگەی بەرزی زانستی و هونەری 🇮🇷 ۱و۲. آکادمی

**ئاکادێمیا** / akadêmya/: ☜ **ئاکادێمی**

**ئاکادێمیک** / akadêmîk/: ئاو.ئاو. زانسـتگایی 🇮🇷 آکادمیک

**ئاکار** / akar/: ناو. ۱. خوو؛ ئەخلاق ‹بە دڵی سـادە و بـە هەسـتی پاکـت/ بـە شـەرم و حـەیا و ئاکـاری چاکت// منت کردووە شێت و وێتی خۆت/ وەختە لە سوێیان گیانم دەرچـێ بـۆت «هـێمن»› ۲. ڕەوش؛ کردەوە ‹دەسـکاری خودایـە خـۆم و ئاکاریشـم/ بـۆ هـەرچی دەچـم لـە دەسـتی ئـەودا ڕیشـم «هـەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› 🇮🇷 ۱. اخلاق ۲. کردار

**ئاکارباش** / akarbaş/: ئاو.ئـاو. ئاکارچـــاک؛ خۆش‌ڕەفتار 🇮🇷 خوشرفتار

**ئاکارپەسند** / akarpesind/: ئاو.ئاو. قـامخۆش 🇮🇷 خوش‌اخلاق

**ئاکارچاک** / akarçak/: ☜ **ئاکارباش**

**ئاکارچەوت** / akarçewt/: ئاو.ئاو. کانج؛ بـەدئاکار؛ بەدڕەفتار 🇮🇷 بدعمل

**ئاکارخراپ** / akarx(i)rap/: ئاو.ئـاو. بەدتـەور 🇮🇷 خرابکار

**ئاکاردیئۆن** / akardî'on/: نـاو. جـۆرێ ئـامێری مووسیقایە کیسەیەکی فانووسی لە بنپاڵـدا، بـەو کیسەوە بـا هـاتوچـۆ دەکـا و ڕزنێـک زمانـەی پچووک بە قامـک دەژەنـرێ و دەنگـی سـازەکە پێک‌دێنێ 🇮🇷 آکاردئون

**ئاکارناپەسەند** / akarnapesend/: ئاو.ئـــاو. خراپەکار؛ خراپەکەر 🇮🇷 بدکار

**ئاکارناحەز** / akarnaĥez/: ئاو.ئـاو. بـەدڕەوش 🇮🇷 بدرفتار

**ئاکارناشیرین** / akarnaşîrîn/: ئاو.ئـاو. نـەفاچڵ؛ نەگونجاو 🇮🇷 بدکردار

**ئاکام** / akam/: ناو. ۱. دوماهی؛ دوایی؛ پاشینە ۲. ئەجەل؛ هەنجەڵ؛ کاتی مەرگ ‹زینده بە ئاکامـە› 🇮🇷 ۱. انجام ۲. اجل

**ئاکاو** / akaw/: ئاو.ئاو. زرینگ؛ زیرەک؛ چابک 🇮🇷 زبر و زرنگ

**ئاکبەند** / akbend/: ☜ **ئاک**

**ئاکتینیوم** / aktînyum/: نـاو. توخمـێ کیمیـایی کانزایی ڕادیۆئەکتیڤ، بە ژمـارەی ئـەتومی ۸۹ و کێشی ئەتومی ۲۲۷ 🇮🇷 آکتینیم

**ئاکڵە** / akłe/: ناو. خۆرە؛ گولی 🇮🇷 جُذام

**ئاکنجی** / akincî/: ئاو.ئـاو. ئاکینجە؛ نیشتەجێ 🇮🇷 مُقیم؛ ساکن

**ئاکنجێتی** / akincêtî/: نـــاو. نیشــــتەجێیی؛ سەقامگیری؛ کاری هەدا دان و نیشـتەجێ بـوون لە شوێنێکدا بەتایبەت بۆ ژیان 🇮🇷 سکونت

**ئاکواریوم / akwaryum/**: ناو. ئاوژیدان: ١. شوێنی دەسکرد بۆ زیندوو ڕاگرتن، لێکۆڵینەوە یا شاندانی گیاندارانی ئاوژی ٢. جێگایەکی چوار دەور شیشە بۆ ئەو کارە ﷼ ١و٢. آکواریم

**ئاکولاد / akulad/**: ناو. بیچمی وەکوو دوو بڕۆی پەیوەست ({}) بۆ جیا کردنەوەی وشە، ڕستە یان دێڕ لە یەکتر ﷼ آکُلاد

**ئاکۆ**[1] **/ ako/**: ناو. ١. کێوی بەرز و مەزن ٢. تیرە و هۆزێکی کورد ﷼ ١. کوه بلند ٢. طایفه‌ای کرد زبان

**ئاکۆ**[2]: ناوەڵناو. شەرمێون، بەتایبەت لە قسە کردندا ﷼ خجالتی

**ئاکە / ake/**: ناوەڵناو. نارەسەن؛ خراپ ﷼ بدجنس

**ئاکیل / akîl/**: ☜ ناقیلە

**ئاکیلە / akîle/**: ☜ ناقیلە

**ئاکینجە / akînce/**: ☜ ناکنجی

**ئاگا**[1] **/ aga/**: ناو. هاگا: ١. خەبەر؛ های ‹زگی تێر ئاگای لە برسی نییە «مەسەل»› ٢. قەیران و تیژی نەخۆشی ﷼ ١. خبر؛ اطلاع ٢. بحران بیماری

**ئاگا**[2]: ناوەڵناو. هاگا؛ بەخەبەر: ١. زانا و فامیدە ٢. نەخەوتوو؛ بێدار ﷼ ١. آگاه ٢. بیدار

⊡ **ئاگا بونەوە**: ١. لە خەو هەستان ٢. وشیار بوونەوە ﷼ ١. بیدار شدن ٢. به هوش آمدن

**ئاگا کردن**: ١. ئاگادار کردن؛ خەبەردار کردن ٢. هەست پێ‌کردن ‹لاقم هێندە سڕە، پۆلووی پێوە نێی ئاگا ناکەم› ﷼ ١. آگاه ساختن ٢. احساس کردن

**ئاگا لە خۆ بڕان**: ١. بوورانەوە؛ لەسەر خۆ چوون ٢. بەجارێ هۆش و ئیختیار نەمان ‹هێندەی خۆش دەوێ ئاگای لە خۆ بڕاوە› ﷼ ١. بیهوش شدن ٢. از خود بیخود شدن

**ئاگا لە دەم/ زاری خۆ نەبون**: لە کاتی نەشیاو و نابەجێ قسە کردن و ڕا دەربڕین ‹ئاگای لە دەمی نییە و نافامێ چی دەڵێ!› ﷼ حرف دهن خود را نفهمیدن

**ئاگا لە قونی خۆ نەبون**: /پلار/ لەو پەڕی بێ‌هۆش و گۆشیدا بوون ‹فلانی ئاگای لە قوونی خۆی نییە کردوویانە هەمەکارە› ﷼ پرت بودن

**ئاگا لە مردنی خۆ بون و ئاگا لە کارێک نەبون**: /کنایە/ لەوپەڕی بێ‌خەبەریدا بوون دەرحەق بە کار و بابەتێک ‹دەڵێن تۆ زانیوتە و دەنگت نەکردووە، وەڵلا ئاگام لە مردنی خۆم بووبێ ئاگام لەو باسە نەبووە!› ﷼ از مرگ خود هم خبر نداشتن

**ئاگا لێ‌بون**: هۆش پێوە بوون ﷼ مراقب بودن

**ئاگادار / agadar/**: ناوەڵناو. ئاگەدار: ١. خەبەردار؛ های‌لێ ‹عەشرەت، براگەل، هاوسێ، بەروپشت/ گشت ئاگادار بن ئەو کچە منی کوشت «فولکلۆر»› ٢. پارێزگار ‹خودا ئاگادارت بێ› ﷼ ١. آگاه ٢. نگهدار؛ حافظ

⊡ **ئاگادار بون**: خەبەردار بوون ﷼ خبردار شدن

**ئاگادار کردن**: خەبەردار کردن و ئەغیار کردنەوە ‹باش بوو ئاگاداری کردم دەنا لێم دەقۆمی› ﷼ مطّلع کردن

**ئاگادارنامە / agadarname/**: ☜ ئاگادارینامە

**ئاگاداری / agadarî/**: ناو. ئاگەداری: ١. بانگەشە؛ ڕێکلام؛ ڕاگەیاندنی بابەتێک بە خەڵک بە نووسراوە، وتار، فیلم یان وێنە ٢. کار و ڕەوتی زانین؛ خەبەردار بوون ‹بۆ ئاگاداری خەڵک ئەم بابەتەم نووسی› ٣. خەبەر؛ هەواڵ ‹ئاگاداریت لە کێشەکانی وڵات هەیە؟› ٤. پارێزگاری؛ چاودێری ‹ئاگاداری لە خاک و ئاوی وڵات ئەرکی سەرشانی هەموومانە› ﷼ ١. آگهی ٢. آگاهی ٣. خبر ۴. مراقبت

**ئاگادارینامە / agadarîname/**: ناو. ئاگادارنامە: ١. لاپەڕەیەک کە بۆ ئاگادار کردنی کەسێک لە شتێک، بۆی دەنێردرێ ‹ئاگادارینامەی بانکی بۆ هاتووە، دەبێ ماڵەکەی چۆڵ بکا!› ٢. لاپەڕەگەلێ کە لە بوارێکی دیاریکراودا با ئاگاداری گشتی،

بلاو دەکرێتەوە ‹ئاگادارینامەی شەڕخوازان بلاو بۆتەوە› ☰ ۱و۲. اطلاعیه

**ئاگایی** / agayî/: ناو. وشیاری؛ زانیاری ‹قەلای ویرم سەیل هووناو بەردەبێ/ بورج ئاگاییم ویران کەردەبێ «مەولەوی»› ☰ آگاهی

**ئاگر** / agir/: ناو. ئاور؛ ئاتر؛ ئاتەر؛ ئار؛ ئاویر؛ ئاهیر؛ ئاهێر؛ ئایر؛ ئایەر؛ ئەیر؛ ئێر؛ ئێگر؛ ئاهر؛ ئاگەر؛ ئاگور؛ ئادر؛ ئاڤر؛ گڕە؛ هایر؛ هەتار؛ هاتەر؛ ئارگ؛ یاگی؛ تەش؛ تەز؛ تەژ؛ ئزگل: ۱. گڕی سەرهەلداو لە تێکەلاوی سووتەمەنی و هەوا کە ڕووناکی و گەرمی لێ دەبێتەوە ‹ئاگر بە ئاگر ناکوژێتەوە «مەسەل»› ۲. *[مەجاز]* ئەلیا؛ خولیا؛ قرم؛ هەوەس؛ ئارەزووی پڕتین و زوو ڕابر ☰ ۱. آتش ۲. هوس

▣ **ئاگری بن کا**: ☜ **ئاگری ژێر کا**

**ئاگری بێئامان**: *[کینایە]* بەلا و دەردیسەری گەورە ☰ بلا و مصیبت بزرگ

**ئاگری خودێ**: بەلای ئاسمانی ☰ بلای آسمانی

**ئاگری ژێر کا**: ناو. *[کینایە]* ئاگر/ ئاوری بن کا: ۱. ئاگری ژێر بوول؛ هێزی بەرپیوار کە ڕێ پێدەچێ دەرکەوێ و کارا بێتەوە ۲. لە بنەوە بڕ؛ نەرمەبڕ ‹هەتا وەک ئاگری ژێر کان لەگەل یەک/ ئەگەر تۆفان بێ لەشکرتان بە پووشەک «حاجی قادر»› ☰ ۱. آتش زیر خاکستر ۲. آبزیرکاه

**ئاگری نەورۆز**: ئاگرێ کە ڕۆژی سەرەتای سال دەکرێتەوە ☰ آتش نوروز

⊡ **ئاگر باراندن**: *[کینایە]* گوللەباران کردن ☰ گلوله باران کردن

**ئاگر بردن**: ۱. ساز و ئامادە بوون بۆ سووتان ۲. *[کینایە]* ئاگر پێبوون؛ زۆر بەپەلە بوون ☰ قابل اشتعال بودن

**ئاگر بەر بوون**: ئاور بەر بوونەوە؛ ئاگر سەرهەلدان ☰ آتش افتادن (در جایی یا چیزی)

**ئاگر بەر دانەوە**: سووتمان نانەوە؛ ئاور لە جێگەیەک بەردان ☰ آتش افروختن

**ئاگری پێبون**: ☜ **ئاگر بردن ـ۲**

**ئاگر تێ بەربون**: ئاگر گرتن؛ گڕ گرتن ☰ آتش گرفتن

**ئاگر تێ چون**: *[کینایە]* ۱. بێئۆقرە بوون ۲. ئێرەیی بردن ☰ ۱. بیقرار شدن ۲. حسادت کردن

**ئاگر خۆش کردن**: ۱. زۆر کردنی گڕ و بلێسەی ئاور ۲. *[کینایە]* شەڕ نانەوە؛ بۆ هەرا و کێشە دنە دان ☰ ۱. دامن زدن به آتش ۲. فتنه برپا کردن

**ئاگر دامرکاندن**: ئاگر کوژاندنەوە؛ ئاگر ڤەمراندن: ۱. داکوژاندنەوەی ئاور ۲. *[کینایە]* کۆتایی پێ هێنانی شەڕ و ئاژاوە ☰ ۱. خاموش کردن آتش ۲. پایان دادن به آشوب

**ئاگر دان**: ۱. ئاور لە شتێ بەردان ۲. هاویشتنی تۆپ و تەقاندنەوە بە هۆی بارووت و ... ☰ ۱. آتش زدن ۲. منفجر کردن

**ئاگر داییسان**: ۱. هەلبوونی ئاور ۲. *[کینایە]* ئۆقرە و ئارام لێ بڕان ‹کەوتە خۆ، دای لە شەقەی بال دیسا/ ئاگرێکی لە دەروون داییسا «هەژار، بۆ کوردستان»› ☰ ۱. روشن شدن آتش ۲. بیقرار شدن

**ئاگر ڤەمراندن**: ☜ **ئاگر دامرکاندن**

**ئاگر ڤێخستن**: ئاور کردنەوە؛ ئاگر بەردانەوە ☰ آتش روشن کردن

**ئاگر کردن**: ئاگر کردنەوە ‹چاوەکەت ئاگر لە سینەی عاشقی میسکین دەکا/ مەستە، مەیلی چەن کەبابێکی دلی خوێنین دەکا «نالی»› ☰ خبردار شدن

**ئاگر کردنەوە**: ۱. هەلکردنی ئاگر ۲. *[مەجاز]* تووڕە بوون ‹قسەی مێرد کردنی لەگەل بکەی، ئاگر دەکاتەوە!› ☰ ۱. آتش روشن کردن ۲. از

کوره دررفتن

**ئاگر کوژاندنەوە:** ☜ **ئاگر دامرکاندن**

**ئاگر کەوتنە جەستەی کەسێک:** [کینایە] ئۆقره لـه کەسێ بڕان؛ سەبر بۆ کەسێ نەمان ≡ کک بـه تُنبان کسی افتادن

**ئاگر گرتن:** گڕ تێچوون: ١. ئاور تێبـەربوون ٢. [مەجاز] زۆر تووڕه بوون ≡ ١. آتـش گـرفتن ٢. از کوره دررفتن

**ئاگر گەشاندنەوە:** بڵێسەدار کردنی ئاگر ≡ آتش (بر)افروختن

**ئاگر لە دەمدا بوون:** [کینایە] زۆر بـه پەلـه قسـه کردن ≡ تند ـ تند حرف زدن

**ئاگر لێبارین:** [کینایە] تووشی بەلا و دەرد هـاتن ≡ آتش به جان کسی افتادن

**ئاگرئایسێن** / agir'aysên/: ئاوەڵناو. وێکەر؛ پێکـەر ≡ آتش‌افروز

**ئاگرئاییسێن** / agir'ayîsên/: ئاوەڵناو. ١. وێکـەر؛ تایبەتمەندی ئەوی ئاورێـک هەڵـدەکا ٢. [کینایە] ئاژاوەگێڕ ≡ ١و٢. آتش‌افروز

**ئاگراو** / ag(i)raw/: ناو. [کینایە] بادە؛ شەراب؛ مەی ‹گولاو و ئاگراوه بادە ئەمشەو/ تەرەبناکە مەی و ساقی غەزەبناک «مەحوی»› ≡ شراب

**ئاگربار** / agirbar/: نـاو. ڕەشـاش؛ مترالیـۆز ≡ آتشبار

**ئاگرباران** / agirbaran/: نـاو. [کینایە] ١. گـەرمای زۆر و بەتـەوژم ٢. شـەڕه تفـەنگ ٣. پشـێوی و ئـاژاوه ≡ ١. گرمـای شـدید ٢. تیرانـدازی شـدید ٣. هرج‌ومرج

**ئاگربازی** / agirbazî/: نـاو. ئـاگرێن؛ ئاتەشـبازی؛ ئەیرەکلـێ؛ گڕگـران؛ گەمـە بـە ئـاگر؛ کـاری تەقەکردن و فیشەکەشێتە هەڵـدان لـه جێـژن و خۆشیدا ≡ آتش‌بازی

**ئاگربڕ** / agirbiř/: نـاو. ١. کـاری تەمرانـدنی شەوات؛ دامرکاندنی سـووتمان ٢. [کینایە] کـاری کوژاندنەوەی شەڕ و ئاژاوه ≡ ١. اطفـای حریـق ٢. کار سرکوب کردن یا خواباندن آشوب

**ئاگربەر** / agirber/: ئاوەڵناو. ئاگربەرەک؛ ئامادە بۆ سـووتان ‹پووشـووەکەت زۆر بـاش و ئاگربـەره› ≡ آماده برای سوختن

**ئاگربەرەک**[1] / agirberek/: ناو. بلۆق؛ تۆقلە؛ پـۆڕگ ≡ تاول

**ئاگربەرەک**[2]: ☜ **ئاگربەر**

**ئاگربەس** / agirbes/: ناو. ڕەوتی وێستانی تەقـه و شەڕ ≡ آتش‌بس

**ئاگرپارە** / agirpare/: ئاوەڵناو. [مەجاز] ئاتەشـپارە؛ هار و هاج؛ وریا و زیت ≡ آتشپاره

**ئاگرپژێن** / agirp(i)jên/: ناو. ئاگرپشـان؛ ئـاگری؛ بورکان؛ گڕکان؛ ئارکان؛ قوڵـکان؛ نـووره؛ چیـای سەر بە ئاگر ≡ آتشفشان

**ئاگرپشان** / agirp(i)şan/: ☜ **ئاگرپژێن**

**ئاگرپەرست** / agirperist/: ئاوەڵـناو. [پـلار] ئاورپەرست؛ گـاور؛ مـەجووس؛ پەیـڕەوی دیـنی زەردەشت ≡ آتش‌پرست

**ئاگرخان** / agirxan/: نـاو. ئاگرخانـه؛ ئاورخانـه؛ ئاتەشـخانە: ١. کـووره؛ کۆرەخانـه؛ گەرمخانـه؛ کویرهـه؛ کویرمـه؛ تـەزگا؛ تـەژگا ٢. ئـاگردان؛ جێگەی ئاگر لە سـەماوەری زووخاڵـی، گەمیـه و کارخانەدا ≡ ١و٢. آتشخانه

**ئاگرخانه** / agirxane/: ☜ **ئاگرخان**

**ئاگرخۆره** / agirxore/: نـاو. وشـترمر؛ هەشـترمە؛ حوشترمەل؛ حوشترمرخ؛ کەردیکل؛ پەلەوەرێکی زۆر گەورەی بـاڵنـەگره، بـه سـەر و مـل و ڕانی بێپەڕ یان کـەمپـەڕ، ڕەنگـی ڕەش و بریقـەدار و کلـک و سەربالـی سـپییەوه کـه مێنگـەکانیان قاوەیی ئامـاڵ خۆڵەمێشـییه و بـەرزی بـڕێ لـه نێرەکانیان دەگاتە ٢,٥ میتر ≡ شترمرغ

**ئاگرخۆشکەر** / agirxoşker/: ناو. [کینایە] ئاگرخۆشکەرە؛ ئاگرگەشێن؛ شەڕهەڵایسێن؛ کەسێ کە بە شۆفاری کردن، شەڕ و ناکۆکی زۆرتر دەکاتەوە ⚑ آتش‌بیار معرکه

**ئاگرخۆشکەرە** / agirxoşkere/: ☜ **ئاگرخۆشکەر**

**ئاگردان** / agirdan/: ناو. ١. ئاورگ؛ ناوگۆڕک؛ مقەڵێ؛ جێئاگر ٢. ☜ **ئاگرخان -٢** ⚑ ١. آتشدان ٢. ☜ **ئاگرخان -٢**

**ئاگردو** / agirdû/: ناو. ١. ئاوردوو؛ سووتەمەنی ٢. دار و چیلکەی ئاوربەر بۆ سووتاندن ⚑ ١. سوخت ٢. چوب یا اشیای سوختنی

**ئاگردەمێن** / agirdemên/: ناو. ١. دەمەی ئاسنگەری و مسگەری ٢. ئەو کەسە کە ئەو دەمە دەدەمێنێ ٣. کەسێ کە با لە ئاگر دەدا ⚑ ١. دم آهنگری و مسگری ٢. دمندە در آتش ٣. بادزن در آتش

**ئاگرڤەکوژێن** / agirvekujên/: ناو. ١. ئەو کەسەی ئاگر دەکوژێنێتەوە ٢. کەرستەی ئاگر کوژاندنەوە ⚑ ١. آتش‌نشان ٢. وسایل آتش‌نشانی

**ئاگرکێش** / agirkêş/: ناو. ١. مەسێ؛ خاکەنازی ناوتەنوور ٢. ئاورکێشی ئاسنگەری ⚑ ١و٢. خاک‌انداز

**ئاگرگرە** / agirg(i)re/: ☜ **ئاگرگیرە**

**ئاگرگوشک** / agirguşk/: ناو. چەنە؛ چەناگە؛ چەناکە؛ چناکە؛ ئەرزینگ؛ ئارزینگ ⚑ زنخ

**ئاگرگەشێن** / agirgeşên/: ☜ **ئاگرخۆشکەر**

**ئاگرگیرە** / agirgîre/: ناو. ئاگرگرە؛ دەستەچیلە؛ دەستەی پووش و پەلاش بۆ بن ئاگر ⚑ افروزنه

**ئاگرملیچ** / agirm(i)lîç/: ناو. ئاگرمەلووچ؛ ئاگرمەلووچک؛ ئاگرمەملیچ؛ خەزایی؛ عەینەمەل؛ باڵندەیەکی بەڵەکە بە قەد سێروو ⚑ سار صورتی

**ئاگرمەلوچ** / agirmelûç/: ☜ **ئاگرملیچ**

**ئاگرمەلوچک** / agirmelûçik/: ☜ **ئاگرملیچ**

**ئاگرودو** / agir û dû/: ناو. [مەجاز] ماڵوحاڵ؛ ماڵومیزان؛ ئاور و دووکەڵ ⚑ خانه و کاشانه

**ئاگرۆ** / ag(i)ro/: ناو. لالە؛ هەلالە؛ ڕەبەنۆک ⚑ لاله

**ئاگرۆچکە** / ag(i)roçke/: ناو. ئاگرۆکە؛ ئاورۆچکە؛ ئاورۆکە؛ ئاگرەقلێ؛ ئاگری گچکە، زۆرتر منداڵان بۆ گەمە دەیکەنەوە ⚑ آتش کوچک

**ئاگرۆک** / ag(i)rok/: ناو. ئاگرە: ١. شەڕا؛ ئاگرەکە؛ بای گەرم کە گیا و سەوزە وشک دەکا ٢. زەردەبرین؛ هەوڵەفەرەنگی؛ جۆرێک برینی تووش و میکرۆبی سەر پێستە، پتر وەک پۆڕگ و بلۆق لە سەر دەم و چاوی منداڵان پەیدا دەبێ ⚑ ١. باد سام ٢. زرد زخم

**ئاگرۆکە** / ag(i)roke/: ☜ **ئاگرۆچکە**

**ئاگرە** / ag(i)re/: ☜ **ئاگرۆک**

**ئاگرەقلێ** / ag(i)req(i)lê/: ☜ **ئاگرۆچکە**

**ئاگرەقولە** / ag(i)reqûle/: ناو. ئاگرەقوون؛ ئاگرەقوونە؛ گوڵئەستێرە؛ گووئەستێر ⚑ کرم شبتاب

**ئاگرەقون** / ag(i)reqûn/: ☜ **ئاگرەقولە**

**ئاگرەقونە** / ag(i)reqûne/: ☜ **ئاگرەقولە**

**ئاگرەکە** / ag(i)reke/: ☜ **ئاگرۆک -١**

**ئاگرەمەلیچ** / ag(i)rmelîç/: ☜ **ئاگرملیچ**

**ئاگرهەڵکەر** / agirhełker/: ناو. پاکڵ؛ پاکڵە ⚑ افروزندەی کورە

**ئاگری**[١] / ag(i)rî/: ناو. گڕکان؛ ئاگرپژێن؛ چیای سەر بە ئاگر ⚑ کوه آتشفشان

**ئاگری**[٢]: ئاوەڵناو. ١. ئاورین؛ ئاگرین ٢. [مەجاز] هۆکی؛ بەئالۆش (بۆ ژن) ⚑ ١. آتشین ٢. شهوتی (زن)

**ئاگرین** / ag(i)rîn/: ئاوەڵناو. ئاورین؛ ئاهرین؛ ئایرین؛ ئایرناک: ١. لە ئاگر (گرتی دەسی گورزە ئاگرینێ/ زەرد بۆوە لە ترسی، گۆی زەمینێ «هەژار،

*مەم و زین*»› ٢. *[مەجاز]* گەرموگوڕ؛ بە هەست و تین ‹وتی: مەحوی هەناسەی ئاگرینە/ بە دەم، مـن نازکم، ناوم نەبا قەت «مەحوی»› ٣. ئاورینگ؛ ئاتەشین؛ بە ڕەنگی سووری ڕۆشن ‹گولی ئاگرین› ☰ ١تا٣. آتشین

**ئاگرێن** / ag(i)rên/: ☜ **ئاگربازی**

**ئاگور** / agur/: ☜ **ئاگر**

**ئاگوردی** / agurdî/: ناو. ئاوردوو؛ سووتەنی؛ سووتەمەنی ☰ سوخت

**ئاگوست** / agust/: ناو. ئاب؛ تەباخ؛ مانگی هەشتەمی ڕۆمی کە ٣١ ڕۆژە و لە ١٠ی گەلاوێژەوە تا ١٠ی خەرمانانە ☰ آگوست؛ اوت

**ئاگوڵ** / aguł/: ناو. ئاگوول؛ فێڵ؛ تەڵەکە ☰ نیرنگ

**ئاگوڵباز** / agułbaz/: ناو‌ـناو. ئاگوولباز؛ فێڵباز؛ داوباز ☰ نیرنگباز

**ئاگۆڕداگۆڕ** / agořdagoř/: ناو. ئاڵوگۆڕ؛ کاری گۆڕینەوە ☰ مُعاوضە

**ئاگول** / agûl/: ☜ **ئاگوڵ**

**ئاگولباز** / agûlbaz/: ☜ **ئاگوڵباز**

**ئاگە**[1] / age/: ناو. ئاهگە؛ ئاخگە؛ ئاویلکە؛ گیانەلاو ☰ دم مرگ

**ئاگە**[2]: ناوەلکار. ئەوێ؛ وێدەرێ؛ وێرێ؛ ئەوێندەرێ ‹بەرەش ئاگە› ☰ آنجا

**ئاگە**[3]: جێناو. ئەوێ؛ وێدەرێ؛ وێرێ؛ ئەوێندەرێ ‹ئاگەیە گێلانی؟ ئێگە ئاگەن تۆ هاگات نیا چنە› ☰ آنجا

**ئاگەدار** / agedar/: ☜ **ئاگادار**

**ئاگەداری** / agedarî/: ☜ **ئاگاداری**

**ئاگەر** / ager/: ☜ **ئاگر**

**ئال** / al/: ناو. ١. زەڕنەقووتە؛ تبلی ناوی؛ قامکی هەرە درێژ لە پەنجەدا ٢. لا؛ تەنیشت؛ ڕۆخ؛ کن؛ پاڵ ☰ ١. انگشت وسطی ٢. بغل؛ کنار

**ئالئال** / al'al/: ناو. گوڵێکی سووری بۆنخۆشە ‹سونبول بسەما تێن و گولان پەردە دڕاندن/ بشکفتنە ئالئال و هشین بوونە تەرازن «مەلای جزیری»› ☰ گلی سُرخ و خوشبو

**ئالاستن** / alastin/: چاوگ. ئالستن؛ ئالیستن؛ لێستنەوە؛ لستنەوە؛ لێسان؛ لێسین ☰ لیسیدن

**ئالاف** / alaf/: ناو. ئالاڤ؛ هالاو؛ تین؛ هوروژمی گەرمای ئاور ☰ هُرم

**ئالاڤ** / alav/: ناو. ئالاو: ١. ئاموور و نیر ٢. ئالاو؛ ئامێر؛ ئامراز؛ کەرەستە ‹بە هاریکاریا مە ئەو ئالاڤ بۆ دیار کرنا ڕێیا خڕین هاتینە دانان› ٣. هالاو؛ تین ☰ ١. وسیلەی خیش ٢. ابزار ٣. هُرم

**ئالالە** / alale/: ناو. باتینۆک؛ ڕەبەنۆک؛ گوڵەمێلاقە؛ گوڵاڵەسوورە ☰ آلالە

**ئالان** / alan/: ناو. ١. هۆزێکی کەونارای کورد ٢. گەرمێن؛ گەرمەسێر ٣. شەوچەرە ☰ ١. طایفەای از طوایف باستانی کُرد ٢. قشلاق ٣. شبچرە

⊡ **ئالان کردن**: شەوچەرەی شەوانی زستان گرتن ☰ شبچرەی زمستان گرفتن

**ئالانن** / alanin/: ☜ **ئالاندن**

**ئالاو** / alaw/: ☜ **ئالاڤ**

**ئالایش** / alayiş/: ناو. شەونشینی بە کۆمەڵ بۆ ڕابواردن؛ کۆڕی شەوانەی دۆستان ☰ شب‌نشینی

**ئالبوم** / album/: ناو. دەفتەری هەڵگرتن و پاراستنی وێنە، پارە، تەمر و شتی وا ☰ آلبوم

**ئالخواج** / alx(i)wac/: ناو. دۆشاومژە؛ قامکی شادە ☰ انگشت سبابە

**ئالستن** / alistin/: ☜ **ئالاستن**

**ئالشتە** / alişte/: ☜ **ئاڵشك**

**ئالقان** / alqan/: چاوگ. تێئالان؛ تووش بوون؛ پێوە بوون و گیر خواردن ☰ درگیر شدن

**ئالقاندن** / alqandin/: چاوگ. تێکئالاندن؛ تووش کردن؛ پێوە کردن ☰ درگیر کردن

**ئالقەتیز** / alqetîz/: ☜ **ئاڵقەتیز**

**ئالک** / alik/: ناو. ئالیک؛ ئالێک؛ جەمەجۆی ولاخی یەکسم ☰ علیق

**ئالکان** / alkan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //ئالکای؛ دەئالکێی؛ بئالکێ// تێکهالان ☰ درگیر شدن؛ درهم رفتن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ئالکاو/ چاوگی نەرێنی: نەئالکان

**ئالکاندن** / alkandin/: چاوگ. تێپەر. //ئالکاندت؛ دەئالکێنی؛ بئالکێنە// ئاڵۆز کردن؛ تێکهالاندن ☰ درگیر کردن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەئالکاندن

**ئالکاو** / alkaw/: ناوەڵناو. شێواو؛ شڵەژاو ☰ پریشان؛ سردرگم

**ئالکە** / alke/: ناو. پووتک؛ خوڕە؛ گولی ☰ جُذام

**ئالگ** / alig/: ناو. شوێنەبرین؛ شوێنی زام یان لێکەوتن ☰ اثر زخم یا ضربت

**ئالنگ** / aling/: ناو. ئالوو؛ دۆخی خڕ بوونی بن هەنگڵ ☰ حالت ورم کردن زیر بغل

**ئالنگار** / alingar/: ناو. ڕەوتی کۆ بوونەوە لە خواردنێک ☰ حالت دوره کردن خوراکی

⊡ **ئالنگار بوون**: تێمرووکان؛ لە دەوری شتێ کۆ بوونەوە بۆ خواردن ☰ دوره کردن خوراکی

**ئالوە** / al(i)we/: ناوەڵناو. عادی؛ ئاسایی ☰ عادی

**ئالۆ** / alo/: ناو. ١. ☜ **ئاڵوو١** ٢. هەڵۆ؛ سپر ☰ ١. ☜ **ئاڵوو١** ٢. عقاب

**ئالۆشە** / aloşe/: ناو. ١. گەزنە؛ گەزگەسک؛ گیایەکە لاسقەکەی دەخورێ ٢. ئێسکی لای سەرووی شەویلکە ☰ ١. گیاهی خوراکی ٢. استخوان فوقانی فک

**ئالۆمینیوم** / alomînyum/: ناو. فافۆن؛ توخمێکی کانزایی زۆر سووک بە ژمارەی ئەتومی ١٣ و کێشی ئەتومی ٢٦،٩٨، بە ڕەنگی سپی ئامال خۆڵەمێشییەوە ☰ آلومینیوم

**ئالو** / alû/: ☜ **ئاڵوو١**

**ئالووبالوو** / alûbalû/: ☜ **بالاڵوک**

**ئالوودە** / alûde/: ناوەڵناو. ١. هۆگارە؛ گیرۆدە؛ لۆس؛ فێرە (ئالوودەی تریاک) ٢. سەرقاڵ (تۆ ئالوودەی بەزم جەرگەی هامفەردان/ کەیف مەی موحبەت گرۆی هامدەردان «مەولەوی») ٣. تێوەتلاو؛ تلیاگ (جامێ بە سەهبای دیای بالاکەت/ ئالوودەی غوبار تۆز پالاکەت «مەولەوی») ☰ ١. مُعتاد ٢. درگیر ٣. آغشته

**ئالووز** / alûz/: ناو. خەفەت؛ خەم و کەسەر ☰ غم و اندوه

**ئالوولە** / alûle/: ناو. ١. کۆلانی تەسک و باریک ٢. کۆڵەکە؛ ئەستوون ٣. پیاوی بێشەرم و ئابڕوو ☰ ١. کوچەی تنگ ٢. ستون ٣. مرد بی‌آبرو

**ئالەکە** / aleke/: ناو. ئالەک؛ تەراخوم؛ نەخۆشییەکی چلکی چاوە، دەبێتە هۆی ترسان لە ڕووناکی، ئێش و فرمێسکڕێژی و بڕێ جاریش کوێری ☰ تراخُم

**ئالها** / alha/: ☜ **ئاڵها**

**ئالی** / alî/: ناو. لا؛ ڕەخ؛ تەرەف ☰ طرف؛ سو

**ئالیاژ** / alyaj/: ناو. تێکەلاوی دوو یان چەند کانزا (وەک: برنج، کە تێکەلاوی مس و ڕۆحە) یان کانزایەک دەگەل توخمی ناکانزادا (وەک: پۆلا، کە تێکەلاوی ئاسن و کەربونە) ☰ آلیاژ

**ئالیان** / alyan/: ☜ **ئالان**

**ئالیاندن** / alyandin/: ☜ **ئالاندن**

**ئالیز** / alîz/: ناو. ئەلیز؛ هەڵیز؛ مەشکە ☰ مَشک

**ئالیستن** / alîstin/: ☜ **ئالاستن**

**ئالیسک** / alîsk/: ناو. لێسک؛ ئاسنێکی کەوچکئاسای تیژە بۆ هەڵکۆڵینی چێو ☰ لیسە

**ئالیسکە** / alîske/: ☜ **ئاڵشك**

**ئالیسۆر** / alîsor/: ناوەڵناو. لاسوور (میوە) ☰ نیم‌سرخ (میوه)

**ئالیک** / alîk/: ناو. ١. ☜ **ئالف** ٢. ☜ **ئالك**

⊡ **ئـالیکی دو کـەر پـێ بـەش نـەکران** [پــلار] دەستەوەستان و هیچ نەزانین؛ دەست و پـێ سپیلکە بوون ≡ دستوپا چُلُفتی بودن

**ئالیکار** / alîkar/: ئاوەڵناو. هاریکار؛ یارمەتیدەر ≡ یاریگر

**ئالیکفرۆش** / alîkf(i)roş/: ناو. عەللاف؛ کەسێک چیلکە و خەڵووز و کا و وێنجە دەفرۆشێ ≡ علاّف

**ئالیکە** / alîke/: ناو. ئاموور ≡ خیش

**ئالین** / alîn/: ☜ **ئالان**

**ئالینک** / alînik/: ناو. گوڵەواژ؛ گوڵەسەرکەش؛ خالۆزە؛ گیایەکی لێرەوارییە کە ئێستا لە بن داری پارکەکانیش دەیکەن؛ بە دار و دیوار و ئاسندا دەئاڵێت، گەڵاکانی سەوزێکی تۆخ و شێوەی دڵە، گوڵەکانی زەردی مەیلەو سەوزە، ئەم گیایە ئەگەر زۆر بە لاسکی دارەکانەوە بێت وشکی دەکات ≡ پیچک داردوست؛ عشقه

**ئالینۆک** / alînok/: ☜ **ئارینۆک**

**ئالێرژی** / alêrjî/: ناو. هەستۆکی ≡ آلرژی

**ئالێک** / alêk/: ☜ **ئالک**

**ئالێگرە** / alêgre/: ☜ **ئانێرە**

**ئاڵ**[1] / al/: ناو. هاڵ: ١. [باوەڕی کۆن] ئاڵە؛ هاڵە؛ جندۆکەی دوژمنی زەیستان ٢. ڕەنگی سووری ئاچخ ٣. ئاڵا؛ درەوش ≡ ١. آل ٢. قرمز روشن ٣. پرچم

⊡ **ئاڵ بردنەوە** [باوەڕی کۆن] مردنی زەیستان یان کۆرپەی ساوا بە هۆی جنۆکەی ئاڵەوە ≡ آل به سراغ آمدن

**ئاڵ**[2]: ئاوەڵناو. ١. بە ڕەنگی سووری کاڵ ٢. هاڵ؛ تایبەتمەندی ددانی بە ترشی کولبوو ≡ ١. قرمز روشن ٢. دندان سوده

⊡ **ئاڵ بونەوە** ☜ **هاڵ بونەوە**

**ئاڵا** / ała/: ناو. ١. بەیداخ؛ عالا «سەد شوکور وا من نەمردم، تا کە دیم ئاڵایی کورد/ .../ هەر بژی ئاڵایی کورد و پێشەوای زانایی کورد «قانع»» ٢. پارچەی شاش و تەنک بۆ ورد دابێژتن ٣. ☜ **ئاڵابوک** ٤. قەڵەم «ئاڵا گرت بە دەس خورشیدی خاوەر/ نووسیا بۆ لای بەهرووزی سەروەر «بەیتی خورشید و خاوەر»» ≡ ١. پرچم ٢. وال؛ واله ٣. ☜ **ئاڵابوک** ۴. قلم

**ئاڵابوک** / ałabûk/: ناو. ئاڵا؛ ئاڵە؛ ئاڵەبووک؛ جلەبووکەڵەی ڕەنگامە ≡ لباس عروسک

**ئاڵابێژ** / ałabêj/: ناو. کاری دابێژتنی شەکر و خاکەقەند بە پەڕۆی تەنک ≡ عمل بیختن ریزه قند با پارچه

**ئاڵات** / ałat/: ناو. بەهارات؛ ئیسیوەت و ئەدوا ≡ ادویه

**ئاڵاچی** / ałaçî/: ☜ **ئاڵاهەڵگر**

**ئاڵاخ** / ałax/: ناو. بزار؛ گیابژار؛ ئەو گیا بێ کەڵکانەی کە دەبێ فڕێ درێن ≡ علف هرز

**ئاڵادار** / aładar/: ☜ **ئاڵاهەڵگر**

**ئاڵاش** / ałaş/: ☜ **هەڵاش**

**ئاڵاکەت** / ałaket/: ناو. بژارچن ≡ بیلچەی وجین

**ئاڵاکەر** / ałaker/: ناو. بژارکەر ≡ وجین‌کار

**ئاڵامات** / ałamat/: ☜ **هەڵامەت**

**ئاڵامەت** / ałamet/: ☜ **هەڵامەت**

**ئاڵان** / ałan/: چاوگ. تێپەڕ. //ئاڵای؛ دەئاڵێی؛ بئاڵێ// ئالیان؛ ئالین؛ ئاڵین؛ ئاڵۆسکان «لە ملیا بەختی من ڕەش بوو، بە دەوری خالیا ئاڵا/ لە مل دەستی کە هەڵگرت زولف بە لێوی ئالیا ئالا «؟»» ≡ در هم آمیختن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ئاڵاو/ چاوگی نەرێنی: نەئاڵان

**ئاڵاندن** / ałandin/: چاوگ. تێپەڕ. //ئاڵاندت؛ دەئاڵێنی؛ بئاڵێنە// ئاڵانن؛ ئالیاندن: ١. تێئاڵان؛ ئاڵۆسکاندن ٢. ئاراستە کردن؛ تێهەڵکردن؛ تووڕ دان ≡ ١. بر چیزی آمیختن ٢.

پرت کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەئالاندن

**ئالانن** / ałanin/: ☜ ئالاندن

**ئالاو¹** / aław/: ناو. هـالاو؛ گـەرمای ئـاگر ☰ هُـرم آتش

**ئالاو²**: ئاوەڵناو. تێهالاو؛ ئالۆزکاو ☰ تنیده

**ئالاووالا** / aławwała/: ئاوەڵـناو. ڕەنگاوڕەنـگ ☰ رنگارنگ

**ئالاهەلگر** / ałahełgir/: نـاو. ئـالاچی؛ ئـالادار؛ بەیداخدار ☰ پرچمدار

**ئالایی** / ałayî/: ئاوەڵناو. ڕەنگاوڕەنگ؛ ڕەنگامـە ☰ رنگارنگ

**ئالتون** / ałtûn/: ناو. زێڕ؛ تەلا ‹ئەو توربەتـەی کـە خۆڵ و گڵ و وردەبەردی ئەو/ ئالتوون و زیو و لـیرە و غازی و دراومە «بێخود»› ☰ طلا

**ئالتونتەبـەق** / ałtûntebeq/: نـــاو. گوڵـــێکە پەڕەکـەی ئەسـتێرەییە، لاسـکی نەرمـە و بـۆنی هەیە ☰ از گُل‌ها

**ئالتـونچی** / ałtûnçî/: ناو. زێڕینگـەر؛ زیڕگـەر ☰ زرگر

**ئالتـونی** / ałtûnî/: ئاوەڵـناو. تـەلایی: ١. زێـڕین؛ دروستکراو لە ئالتوون ٢. بە ڕەنگی زەردی وەک ئالتوون ☰ ١و٢. طلایی

**ئالتیڕەم** / ałtîřem/: ناو. کێشانەیەک بەرانبەر بـە ٥٥ گرەم ☰ واحد وزنی معادل ٥٥ گرم

**ئالچاخ** / ałçax/: ☜ ئالچاغ

**ئالچاغ** / ałçağ/: ئاوەڵناو. ئەلچاغ؛ ئالچاخ؛ ئەلچاخ؛ بێئاوڕوو ☰ بی‌آبرو

**ئالخورمایی** / ałxurmayî/: ناو. ڕەنگی ئالی تـۆخ؛ سووری تاریک ☰ خُرمایی

**ئالـدوز** / ałduz/: ئاوەڵـناو. تـەلاکفت؛ زێـڕکفت؛ ئاوەزێڕ؛ میتەلا؛ متەلا؛ داپۆشراو بە توێژێـک زێـڕ ‹ئاسنگەرم بۆ بێـنن بـە مشـتەرییە/ بـۆم دروس بکـا ڕکێفی ئالدوز «بەیت»› ☰ زراندود

**ئالزایمر** / ałzaymir/: نـاو. نەخۆشـی بیرشاشـی، کە پتر بەسـالاچووان تووشـی دەبـن و دەرمـانی ئەستەمە ☰ آلزایمر

**ئالشت** / ałişt/: نـاو. ١. سەودا؛ مامەڵە؛ دان‌وستان ٢. ئاوێتـەکاری ٣. ئـاڵوگـۆڕ ☰ ١. دادوسـتد ٢. آمیختگی ٣. معاوضه

**ئالشتە** / ałişte/: نـاو. ئاونگ؛ خونـاڤ؛ شـەونم ☰ شبنم

**ئالشک** / ałişk/: ناو. ئالشـتە؛ ئالیسـکە؛ ئالیسـکە؛ زوقم؛ سیخوار؛ خووسار؛ خووس ☰ پژ؛ سرماریزه

**ئالشوێرش** / ał(i)şwêrş/: نـاو. دان‌وسان؛ ئالشت؛ مامەڵە؛ سەودا ☰ دادوستد

**ئالف** / ałif/: نـاو. ئالیـک: ١. لـەوەڕ؛ سمـەری؛ چێرە؛ تفاق؛ لەودە؛ لـۆدە؛ واشـە؛ ئـاژاڵ؛ ئۆلـگ؛ خۆراکی پاتاڵ و مالات ٢. [مەجاز] گیا؛ گیواو؛ گژ و گیا ٣. ئاژاڵ؛ پیژاڵ؛ ئاژاڵوپیژاڵ؛ ناوی گشتی بـۆ دەستەیەکی گەورە لە گژوگیای خۆڕسـک و پتـر یەکسالە کە لاسکی چێویان نییە ☰ ١تا٣. علف

▣ **ئالف پێچان**: کۆکردنەوەی ئالفی کۆکەن کـراو کە بە شێوەی مەلۆ دانراوە ☰ جمع کردن علـف درو شده

**ئالف کەندن**: کۆکەن کردن؛ دروونەوەی گیا بۆ بژیوی زستانەی مالات ☰ علف جمع کردن

**ئالفانە** / ał(i)fane/: ناو. پووشانە؛ ئەو باجەی بـۆ لەوەڕ دەستێندرێ ☰ باج چراگاه

**ئالفپێچ** / ałifpêç/: نـاو. سـوەیل؛ گیایەکـە لـە پونگە ڕێوی دەچێ ☰ گیاهی است

**ئالفتـە** / ałifte/: ئاوەڵـــناو. هــــۆگر؛ ئــــالوودە؛ خۆپێوەگرتوو ☰ خوگرفته

**ئالفجاڕ** / ałifcař/: ناو. گیاجاڕ؛ لەوەڕگـە؛ چایـەر ☰ علفزار

**ئالفخوەر** / ałifx(i)wer/: ☜ ئالفخۆر

**ئاڵفخۆر** / alîfxor/: ئاوەڵناو. ئالفخوەر؛ چەڕندە 🇮🇷 چرندە

**ئاڵفدان** / alîfdan/: ناو. ئاخوڕ 🇮🇷 آخور

**ئاڵقان** / alqan/: ☜ **ئاڵکان**

**ئاڵقاندن** / alqandin/: ☜ **ئاڵکاندن**

**ئاڵقە** / alqe/: ناو. ئەڵقە؛ هەڵقا؛ هەڵقە: ١. گەو؛ خەلەک؛ بازنە؛ چەمەر؛ چەمبەر؛ هەڵەک؛ خاز؛ گاخ؛ کەمە؛ گوهارۆک؛ هەڤێرکی؛ کۆڕەو؛ تری؛ قەف؛ قەوە؛ هەر شتێکی خڕ، گرۆڤەر یان بازنەیی ‹ئاڵقەی زوڵف؛ ئاڵقەی زنجیر› ٢. بازنە؛ گەزرک؛ خەلەک؛ ئەو شتانەی کە بۆ خەملاندن و ڕازاندنەوە بە قامک، لووت یان گوێیدا دەکەن ‹ئاڵقەی زێڕ› ٣. گەوی؛ یەکەی بژاردنی شتی جەغزۆکە ‹چوار ئاڵقە فیلم؛ دوو ئاڵقە لاستیک› 🇮🇷 ١تا٣. حلقه

⊡ **ئاڵقە بەستن:** *[کینایە]* دەورە دان؛ کۆز بەستن؛ بە دەوری شتێکدا کۆوە بوون 🇮🇷 حلقه بستن

**ئاڵقە دان:** ١. ئاڵقە بەستن ٢. قەف دان؛ پەپکە دان (مار) 🇮🇷 ١. حلقه بستن ٢. حلقه زدن

**ئاڵقەبەگوێ** / alqebeg(i)wê/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* ئاڵقەلەگوێ؛ کۆیلە؛ بەنی؛ گوێلەمست؛ گوێڕایەڵ؛ گوشبەراواز؛ فەرمانبەری وەکوو نۆکەری وا چما خاوەنەکەی ئاڵقەی لە گوێی کردووە 🇮🇷 حلقه‌به‌گوش

**ئاڵقەتیز** / alqetîz/: ناو. شیرەمار؛ ئاڵقەتیز؛ ئاڵقەتیژ؛ ئاڵقەتیس؛ خوژیلک؛ خوشیلک؛ گیایەکە بە گەڵای پان و پڕ لە شیرەی سپی، لاسکی گۆشتن و پڕ لە شیرە، گوڵی زەرد و چەترییەوە. بە گشتی گیایەکی ژەهراوییە، بەڵام شیلەکەی بە ڕێژەی کەم، بۆ دەرمانی ڕەوانی بە کار دەچێ 🇮🇷 فرفیون؛ شیرسگ؛ شیرشیرک

**ئاڵقەتیژ** / alqetîj/: ☜ **ئاڵقەتیز**

**ئاڵقەتیس** / alqetîs/: ☜ **ئاڵقەتیز**

**ئاڵقەداخ** / alqedax/: ناو. دروشمی ئاڵقەیی کە بە گوێی پاتاڵیەوە دەنێن 🇮🇷 داغ حلقه‌ای احشام

**ئاڵقەڕێز** / alqeřêz/: ناو. ئەڵقەڕێز؛ چەفتەڕێز؛ چەفت؛ سورگی؛ شەوژەن؛ شەوبەن؛ خناق؛ زنجیرۆکەی دەرکە یان دەلاقە داخستن 🇮🇷 چفت

**ئاڵقەزوونە** / alqezûne/: ناو. ئاغزوونە 🇮🇷 سگک

**ئاڵقەلەگوێ** / alqeleg(i)wê/: ☜ **ئاڵقەبەگوێ**

**ئاڵک** / alik/: ناو. ئاڵوو؛ گەلالە؛ گەلالووچک؛ گۆشەک؛ بادامە 🇮🇷 لوزتین

**ئاڵکان** / alkan/: چاوگ. ئاڵقان: ١. تێکئالان ٢. دلگران بوون؛ ئاڵۆز بوون 🇮🇷 ١. درگیر شدن ٢. آزُرده شدن

**ئاڵکاندن** / alkandin/: چاوگ. ئاڵقاندن: ١. تێکئالاندن ٢. ئاڵۆز کردن 🇮🇷 ١. درگیر کردن ٢. آزُردن

**ئاڵگ** / alig/: ناو. لک؛ لوو؛ لۆ؛ لوی؛ لکە؛ مابەک؛ بەرزەک 🇮🇷 غده

**ئاڵمانی**[1] / almanî/: ناو. ١. هەرکام لە کەسانی سەر بە وڵاتی ئاڵمان یان منداڵەکانیان ٢. لە زمانگەلی ژێرمەنی باو لە وڵاتانی ئاڵمان، ئوتریش (نەمسا) و بەشێ لە سویس 🇮🇷 ١و٢. آلمانی

**ئاڵمانی**[2]: ئاوەڵناو. پەیوەندیدار یان پاڵدراو بە وڵاتی ئاڵمانەوە ‹شیرکەتی ئاڵمانی› 🇮🇷 آلمانی

**ئاڵمە** / alme/: ناو. هیوا 🇮🇷 امید

**ئاڵوبۆڵ** / al û bol/: ئاوەڵناو. بۆڵەتەمێ؛ ئاو تێزاوی تەواو نەگەیشتووی ترش و شیرین 🇮🇷 نارسیده؛ کال

**ئاڵوداران** / aludaran/: ناو. ئالاش؛ هەلاش؛ خیزەرە 🇮🇷 انبیره

**ئاڵوگوێز** / al û g(i)wêz/: ناو. جێگۆڕکێ؛ کاری گۆڕینەوە 🇮🇷 معاوضه

**ئاڵوگۆڕ** / al û gor/: ناو. ئاڵوویر؛ ئاڵوویڕ؛ واروگۆڕ: ١. ئەوەزبیەڵ؛ کاری شتێک دان و

شتێک وەرگرتن لە باتی ‹ئەم ئاڵوگۆڕی دینە لە کارا بووە هەتا .../ دەوری یەکێ بە دینی ئەوە نەسخی جوملە دین «مەحوی»› ۲. کاری داکەندنی بەرگی پیس و پاک دەبەر کردن ‹جلەکانت ئاڵوگۆڕ کە!› * هەروەها: **ئاڵوگۆڕ بوون؛ ئاڵوگۆڕ کردن** ≡ ۱. مُبادله ۲. تعویض لباس

**ئاڵوگۆڕکێ / ał û gořkê/**: ناو. کار و ڕەوتی گۆڕینەوە ≡ معاوضه

**ئاڵوواڵ / ał û wał/**: ئاوەڵناو. ڕەنگاوڕەنگ ≡ رنگارنگ

⊡ **ئاڵوواڵ بوونەوە:** *[کینایە]* حەف ڕەنگ گۆڕین؛ شەرمەزار بوون ≡ رنگ‌بەرنگ شدن

**ئاڵووالا / ał û wała/**: ئاوەڵناو. ئاڵوواڵ؛ ڕەنگاوڕەنگ (بۆ جلک و قوماش) ‹کەسێ پوشتانی بالاتە، حەریفی ئاڵووالاتە/ کە شیبهی کاکولی زۆلیدە، سەرگەردانی سەودا بێ «نالی»› ≡ رنگارنگ (پارچه و لباس)

**ئاڵوویر / ał û wêr/**: ☜ **ئاڵوگۆڕ**

**ئاڵوویڕ / ał û wêř/**: ☜ **ئاڵوگۆڕ**

**ئاڵۆ / ało/**: ☜ **خاڵ ـ۲**

**ئاڵۆباڵۆ / ałobało/**: ☜ **بلاڵوک**

**ئاڵۆز / ałoz/**: ئاوەڵناو. هاڵۆز: ۱. شێواو؛ تێکهاڵاو؛ هاڵۆزاو؛ شێواوی وا کە سەرەکەی نەدۆزرێتەوە ‹زولفت بە قەدتدا کە پەرێشان و بلاوە/ ئەمرۆ لە منی شیفتە ئاڵۆز و بە داوە «نالی»› ۲. نەساز؛ نەسازاوی تووش و تووڕە ‹لە خەو هەڵساوە یا ئاڵۆزە چاوت؟/ هەمیشە وایە یا مەخموورە ئەمشەو؟ «نالی»› ۳. شێواو؛ گرژ ‹کونی گیراوی کۆنە شمشالم/ خەونی ئاڵۆز و خاتیرەی تالم «هێمن»› ≡ ۱. سردرگم ۲. بدعُنُق ۳. آشفته

**ئاڵۆزان / ałozan/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //ئاڵۆزای؛ دەئاڵۆزێی؛ بئاڵۆزێ// هاڵۆزان؛ ئاڵۆزکان؛ هاڵۆزکان؛ هاڵۆسکان؛ هاڵۆز/ ئاڵۆز بوون ≡ سردرگُم شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ئاڵۆزاو/ چاوگی نەرێنی: نەئاڵۆزان

**ئاڵۆزاندن / ałozandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //ئاڵۆزاندت؛ دەئاڵۆزێنی؛ بئاڵۆزێنە// ئاڵۆزکاندن؛ شێواندن ≡ بر هم زدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەئاڵۆزاندن

**ئاڵۆزاو / ałozaw/**: ئاوەڵناو. ئاڵۆزکاو؛ ئاڵۆسکاو؛ هاڵۆزاو؛ هاڵۆزکاو؛ هاڵۆسکاو؛ شێواو ≡ برهم‌پیچیده

**ئاڵۆزکان / ałozkan/**: ☜ **ئاڵۆزان**

**ئاڵۆزکاندن / ałozkandin/**: ☜ **ئاڵۆزاندن**

**ئاڵۆزکاو / ałozkaw/**: ☜ **ئاڵۆزاو**

**ئاڵۆزکاوی / ałozkawî/**: ناو. پێچەڵپێچی ≡ پیچیدگی

**ئاڵۆز و پلۆزی / ałoz û p(i)łozî/**: ناو. هەرا و هۆریا و ئاژاوە ≡ آشوب و غوغا

**ئاڵۆزی / ałozî/**: ناو. ۱. شێواوی؛ پشێوی ۲. تێکەڵپێکەڵی (هەودا) ۳. ئۆقرەلێبڕاوی؛ سەرلێشێواوی ≡ ۱. آشوب ۲. سردرگمی (رشته) ۳. بی‌قراری

**ئاڵۆسکان / ałoskan/**: ☜ **ئاڵان**

**ئاڵۆسکاندن / ałoskandin/**: ☜ **ئاڵاندن ـ۱**

**ئاڵۆسکاو / ałoskaw/**: ☜ **ئاڵۆزاو**

**ئاڵۆش / ałoş/**: ناو. ۱. خوروو؛ حەکە؛ خارش؛ کلاشە؛ دۆخی سەرهەڵدانی ختووکە یان هەستۆکی لە لەشدا کە دەبێتە هۆی خورین ۲. *[مەجاز]* هەستی نێرخوازی مێ؛ هەستی سیکسی مێ ‹خەتەنەی ژنان، دەبێتە هۆی داکوژانی ئاڵۆش و چێژی سیکسی› ≡ ۱. خارش ۲. خواست جنسی ماده

**ئاڵۆشاوی / ałoşawî/**: ئاوەڵناو. ئاڵۆشی: ۱. بە خوروو؛ تایبەتمەندی کەسێ کە لەشی دەخورێ ۲. حەشەری؛ بە ئاڵۆش؛ تینووی سیکس کردن (مێ) ≡ ۱. دارای خارش ۲. حشری (ماده)

**ئاڵۆشە / ałoşe/**: ناو. دەسخورێن؛ گەزنە؛ خەلەنگ

🀄 گزنه

**ئاڵۆشی / aloşî/:** ☜ **ئاڵۆشاوی**

⊡ **ئاڵۆشی بوون:** هەوەسی بوون؛ حەشەری بوون 🀄 حشری شدن

**ئاڵۆفون / alofun/:** ناو. *[دەنگناسی]* بچووک‌ترین یەکەی دەنگناسی کە دێتە سەر زار بەڵام مانای مورفیم و وشە ناگۆڕێ و ناچێتە ناو ڕێنووسەوە (وەک: [ص] و [ط] لە زمانی کوردی و [ڕ] و [ڵ] لە زمانی عەرەبیدا) 🀄 واجگونه

**ئاڵو / alû/:** ناو. ١. ئالوو؛ هاڵوو؛ ئاڵۆ؛ ئالۆ؛ گەلالە؛ گلالە؛ گەلالوچک؛ گەلالووچک؛ گۆشەک؛ گوشەک؛ لکەمل؛ بادامە؛ لەوزە؛ تینگ؛ مەرازە؛ مەلاژە؛ هەرکام لە دوو لووی ئەملا و ئەولای قوڕگ کە لە ناو دەمەوە دیارە ٢. ☜ **ئالنگ** 🀄 ١. لوزتین ٢. ☜ **ئالنگ**

⊡ **ئاڵو کەوتن:** ئاڵوو هاتن؛ ئاوسانی لەوزە 🀄 ورم کردن لوزه

**ئاڵوباڵو / alûbalû/:** ☜ **بالاڵوك**

**ئاڵوبخارا / alûb(i)xara/:** ناو. ئاڵووبوخارا؛ هەلووژەی سووری ئامال ڕەش 🀄 آلو بخارا

**ئاڵوبوخارا / alûbuxara/:** ☜ **ئاڵوبخارا**

**ئاڵوبەلاڵوک / alûbelalûk/:** ☜ **بالاڵوك**

**ئاڵوچە / alûçe/:** ☜ **هەڵووژە**

**ئاڵودار / alûdar/:** ناو. ئەو دارانەی لە خانوو داپۆشیندا دەکەونە سەر کاریتە 🀄 چوب‌های سقف

**ئاڵودە / alûde/:** ئاوەڵناو. *[کینایە]* ڕەسوودە؛ خوویێ‌گرتوو 🀄 خوگرفته

**ئاڵە / ale/:** ناو. ١. ☜ **ئاڵ -١** ٢. ☜ **ئالابوك** ٣. پەڵەی دەموچاوی ژنی ئاوس ٤. پارچەی شاش بۆ دابێژتن ٥. نەخۆشییەکە لە ناو گەڵدا پەیدا دەبێ 🀄 ١. ☜ **ئاڵ -١** ٢. ☜ **ئالابوك** ٣. لکەهای صورت زن آبستن ٤. فیلتر پارچەای ٥. آتشک

**ئاڵەبوک / alebûk/:** ☜ **ئالابوك**

**ئاڵەبێژ[١] / alebêj/:** ناو. ١. کاری دابێژتن بە پەڕۆی تەنک و شاش ٢. نەرمەبێژ؛ هووربژار؛ پارچەی تەنک و شاش 🀄 ١. عمل بیختن با الک پارچەای ٢. بیزن پارچەای

**ئاڵەبێژ[٢]:** ئاوەڵناو. *[مەجاز]* زۆر ورد 🀄 بسیار ریز

**ئاڵەت / alet/:** ناو. ١. ئیسیوەت؛ ئیسۆت ٢. داروکە پەراوێزی شیشەگەلی پەنجەرەی ئۆرووسی 🀄 ١. فلفل ٢. چهارچوب شیشەهای پنجرەی اُرُسی

**ئاڵەتاج / aletac/:** ☜ **هەڵەتانج**

**ئاڵەتانج / aletanc/:** ☜ **هەڵەتانج**

**ئاڵەتاو / aletaw/:** ناو. پیازاو؛ چێشتی ئاوەکی و ساکار لە ئاو و پیازداخ 🀄 آش پیاز

**ئاڵەتی / aletî/:** ئاوەڵناو. ١. تون؛ ئاڵەت‌لێ‌دراو ٢. *[مەجاز]* تووڕە و قەلس؛ ئاڵەتی مەزاج 🀄 ١. تُند ٢. تُندمزاج

**ئاڵەڕزگە / ałeřizge/:** ناو. ترێ‌مارانە؛ تەماتەمرۆژە 🀄 تاجریزی

**ئاڵەک / alek/:** ناو. ئاڵەکە؛ تەراخوم؛ نەخۆشییەکی چلکیی چاوە، دەبێتە هۆی ترسان لە ڕووناکی، ئێش و فرمێسکی زۆر و بڕێ جار کوێری 🀄 تراخُم

**ئاڵەکۆک / alekok/:** ناو. هالەکۆک؛ هەڵەکۆک: ١. جۆرێ ئەسپنگی تووکنە بنکێکی هەیە لە جۆزەردانــدا دەریـدێنن و دەیخۆن ٢. *[کینایە]* دیاری سووک و هەرزان (دیاری شوانەوێڵە ئالەکۆکە «مەسەل») 🀄 ١. شنگ اسبی ٢. برگ سبز

**ئاڵەکە / aleke/:** ☜ **ئاڵەك**

**ئاڵەم / alem/:** ☜ **عالەم**

**ئاڵها / alha/:** ناو. ئالها؛ ئەلها؛ واز؛ مگێز 🀄 آرزو

⊡ **ئاڵها کردن:** ١. تاسە کردن؛ ئارەزوو کردن ٢.

داوا کردن ‹له دوێکەوه ئالهای کولیچه ئـەکا› 🇮🇷 ١. آرزو داشتن ٢. خواستن

**ئـاڵی** / ałî/: ئاوەڵـناو. ژن‌ئاغـه؛ ژناخـه؛ دەسـتگۆ؛ ژن‌وەزوور؛ شاکەڵ؛ شەکله؛ چەکڵێ؛ ژێردەست و گوێ‌لەمستی ژن 🇮🇷 زن‌ذلیل

**ئاڵیـان** / ałyan/: چـاوگ. ئـالان؛ لـێ‌پێچـان 🇮🇷 پیچیدن (دور چیزی)

**ئاڵیاو** / ałyaw/: ئاوەڵناو. ئالاو؛ هـالاو؛ پێچـراو 🇮🇷 پیچیده

**ئاڵی‌پڵنگ** / ałîp(i)łing/: ناو. حندرحۆ؛ داردوولەق 🇮🇷 الاکلنگ

**ئاڵیسکه** / ałîske/: ☜ **ئاڵشك**

**ئاڵین** / ałîn/: ☜ **ئالان**

**ئام**[١] / am/: ناو. مام؛ مامه؛ مامۆ؛ ئاپ؛ بـرای بـاوک 🇮🇷 عمو

**ئام ـ**[٢]: پێشـگر. هام ـ؛ پێشگری هاوبەشـی ‹ئامپـا؛ ئامراز› 🇮🇷 هم ـ

**ئاماتور** / amatur/: ئاوەڵـناو. ساز؛ تـەیار؛ حـازر 🇮🇷 آماده

**ئاماتۆر** / amator/: ئاوەڵناو. ١. به کار و چالاکییەک (زانستی، هونەری، وەرزشـی و...) بـۆ سـەرگەرمی یان حەز، بێ ئەوەی ژیانی پێوه بـەڕێوه بچـێ ٢. تازەکار؛ نەشارەزا 🇮🇷 ١و٢. آماتور

**ئاماج** / amac/: ☜ **ئامانج**

**ئاماده** / amade/: ئاوەڵناو. ١. ساز؛ تەیار؛ حـازر ٢. هێبەر؛ دەردەست؛ دۆخـی هـەبوون لـه شـوێنی بەرباس 🇮🇷 ١. آماده ٢. حاضر

◻ **ئامـاده بـون**: ١. ساز بوون؛ تەیار بوون ‹قانعا بـۆ کوشتنی نیشتمان‌فرۆش ئاماده به!/ خـواهِ شـێخی بایەزیـد و خـواهِ نەفسـی بوولەهـەب «قـانع»› ٢. حازر بوون؛ له شـوێنێکدا هـەبوون 🇮🇷 ١. آمـاده شدن ٢. حضور یافتن

**ئامادەبوان** / amadebûwan/: ناو. ئەوانەی له کـۆڕ و کۆبوونەوەیەکدا بەشدارن 🇮🇷 حُضار

**ئامادەکراو** / amadek(i)raw/: ئاوەڵـناو. سـازکری؛ ئامادەکراو 🇮🇷 مهیا

**ئامادەکـەر** / amadeker/: نـاو. بەرهەڤـکار 🇮🇷 آماده‌کننده

**ئامادەیی** / amadeyî/: ناو. ١. تـەیاری؛ بەرهەڤـی؛ وناری؛ دۆخی ساز بوون ‹ئامادەیی چێشـتخانەکان بۆ وەرگرتنی میوان› ٢. ڕاهاتوویی؛ خاراوی؛ سازی ‹ئامادەیی خوێندکاران بـۆ ئەزموونـەکانی زانکـۆ› ٣. دواپلەی خوێنـدن لـه قوتابخانـەکانی هـەرێم ٤. پلەی پێش سەرەتایی لـه سیسـتەمی خوێنـدنی ئێران 🇮🇷 ١و٢. آمادگی ٣. متوسطه ٤. آمادگی

**ئامار** / amar/: ناو. سەرژمێری؛ ژمێریاری؛ کـاری بژاردن 🇮🇷 آمار

**ئامارات** / amarat/: ناو. ئامراز 🇮🇷 ابزار

**ئاماژ** / amaj/: ☜ **ئامانج**

**ئاماژه**[١] / amaje/: ناو. هێمـا؛ ئیشـارەت ‹پەنجـەی نوورت ئاماژه که و بیخەره سەر ناوچـەوانی هـەرێمی سارد «شێرکۆ بێکەس»› 🇮🇷 اشاره

**ئاماژه**[٢]: ئاوەڵکار. سـەرەڕا؛ سـەربار؛ زیـاد لـەوه 🇮🇷 بەعلاوه

**ئامـاس** / amas/: نـاو. پـەنام؛ دۆخـی پـەنمین 🇮🇷 آماس

**ئاماسـان** / amasan/: چـاوگ. ئاماسـین؛ ئاوسـان؛ هەڵمسان 🇮🇷 آماسیدن

**ئاماسه** / amase/: ناو. کوان؛ دمەڵ 🇮🇷 دُمل

**ئاماسین** / amasîn/: ☜ **ئاماسان**

**ئامالْ** / amał/: ئامراز. وێچـوو؛ نێزیـک بـه ‹بـۆری ئامال سەوز› 🇮🇷 متمایل به

**ئامـاڵبۆر** / amałbor/: ئاوەڵـناو. بۆربـاو؛ بۆرەقنـه؛ بۆرەکی؛ بۆرەڵۆک 🇮🇷 مایل به خاکستری

**ئاماڵتاڵ** / amałtał/: ئاوەڵناو. گەمۆر؛ تفت 🇮🇷 گس مایل به تلخ

**ئامالّخوار** / amałx(i)war/: ئاوەڵناو. تێڵ؛ تیل؛ تۆزێ لار ☰ کج؛ مایل

**ئامالّڕەش** / amałřeş/: ئاوەڵناو. ڕەشباو؛ ڕەش‌باڤ؛ مەیلەوڕەش ☰ سیەفام

**ئامالّزەرد** / amałzerd/: ئاوەڵناو. زەردباو؛ زەرباو؛ زەربەش ☰ زردفام

**ئامالّسپی** / amałs(i)pî/: ئاوەڵناو. سپیکەڵە؛ سپیلە؛ سپی‌واش ☰ مایل به سفید

**ئامالّسەوز** / amałsewz/: ئاوەڵناو. هەوزەک؛ ئامالّ‌کەسک ☰ سبزفام

**ئامالّکەسک** / amałkesk/: ئاوەڵناو. هەوزەک؛ ئامالّ‌سەوز ☰ سبزفام

**ئامان**[1] / aman/: ناو. ١. دەفر؛ ئیربار؛ قاپ و قاچاغ ٢. پەنا؛ پەسیو ☰ ١. ظرف ٢. پناه

⊡ **ئامان خواستن:** هاتنە ڕایی؛ پەنا بۆ کەسێک بردن بە ئومێدی پارێزران ☰ امان خواستن

**ئامان پێ‌هەڵێنان:** وە ئامان هەڵێنان؛ جاڕز کردن؛ یاس و هەراسان کردن ‹هێندی پێ‌کوتووم ئامانی پێ‌هەڵێناوم› ☰ عاصی کردن

**وە ئامان هەڵێنان:** ☜ ئامان پێ‌هەڵێنان

**ئامان**[2]: دەنگ. ١. دەغیل؛ وشەی پەنا و هێمنی ویستن ‹نەواتم دەخیل ئامان سەد ئامان/ وێت مەدەر وە مەیل نەو تووڵ نەمامان «مەولەوی»› ٢. های؛ هاوار؛ هەی هاوار ☰ ١. امان ٢. هوار

⊡ **بە ئامان و زامان:** بە هیچ جۆرێ؛ بە هیچ شێوەیێ ‹بە ئامان و زامان دەس ناکەوێ› ☰ بە هیچ وجه

**ئامانج** / amanc/: ناو. ئاماژ؛ ئاماج؛ عەمانج: ١. نیشانە؛ کێلک؛ ئەو شتەی بۆ تیر هاویشتن دە بەرچاو دەگیرێ ‹تێن سینەیان پەیکان نهین / ئامانجێ وان تیران ئەمین «مەلای جزیری»› ٢. دۆز؛ مەرام؛ مەبەست ‹ئەی زەمان! ئەی کات! ئەی ڕۆژی ڕەشم!/ لە ئامانج، ئاوات، هیوا، بێ‌بەشم «ئاوات»› ٣. خزم و کەس و کار ٤. ئارمانج؛ ئارمان؛ گاڤین؛ هەنی؛ کاربەند؛ ئەوەی پێگەیشتنی دەبێتە مەبەست ‹دە قانع سەرکەوە بۆ سەر منارەی بەرزی ئامانجت/ لەوێدا بانگی گشتی دە و بڵێ وا ڕۆژی کوردانە «قانع»› ٥. بەر؛ وەر؛ شوێنی مەبەست لە ڕۆیشتندا ‹لە بەغدا دەرچووە، سەیوانە ئامانجی/ ڕێ چۆڵ کەن ئەی برای زازایی و کرمانجی «گۆران»› ☰ ١. آماج ٢. مرام ٣. اقوام ۴. آرمان ۵. مقصد

**ئامانگورێ** / amangurê/: ناو. جۆرێ مەقام ☰ آهنگی است

**ئامانە** / amane/: ☜ ئائەمانە

**ئامانەت** / amanet/: ☜ ئەمانەت

**ئامانەتی** / amanetî/: ☜ ئەمانەتی

**ئاماوزێ** / amawzê/: ناو. مشەما؛ پەڕۆیەکی تەنکە دە شەمی هەڵدەکێشن و دەیخەنە سەر کوان و برین ☰ نوعی مُشمع

**ئاماولوای** / amawl(i)way/: ناو. هاتوچوو ☰ آمدوشد

**ئامای** / amay/: چاوگ. هاتن ‹ئارەزووی ئامای مەرگ وێت کەردەن/ گۆیا خەلاسیت وە دل ئاوەردەن «مەولەوی»› ☰ آمدن

**ئامایی** / amayî/: ناو. کوێری؛ کۆری؛ نابینایی ☰ نابینایی

**ئامباز** / ambaz/: ئاوەڵناو. ئامبازد؛ ئاوقا؛ ئاوقە؛ ئاوقەد؛ هاوقا؛ عامباز؛ ئاوڕیش؛ تێک‌هالاو؛ تێک‌گیراو ☰ گلاویز

⊡ **ئامباز بون:** ١. بە هەڵەداوان بۆ یەکتر چوون و دەس لە مل یەک کردن ٢. خۆ تێ‌هەڵکردن؛ تەپ دانە سەر؛ هاشاوڵ بۆ بردن ‹سەگەکە لەگەڵکوو دیتی ئامبازی بوو› ☰ ١. یکدیگر را در آغوش کشیدن ٢. حمله کردن و گلاویز شدن

**ئامبازد** / ambazd/: ☜ ئامباز

**ئامبولی** / ambulî/: ناو. کەڵەکەی چەوری، هەوا یان تراو لە نێو ڕەگەکانی لەش کە لەگەڵ خوێندا دەڕوا و ئەگەری گیرانەدنی ڕەگەکانی هەیە ≡ آمبولی

**ئامبولانس** / ambulans/: ناو. ماشێنی تایبەتی جێبەجێ‌کردنی نەخۆش و گەزنگازان ≡ آمبولانس

**ئامبور** / ambûr/: ☜ **ئامور**

**ئامبێز** / ambêz/: ☜ **ئامێز**

**ئامپا** / ampa/: ☜ **هامپا**

**ئامپول** / ampûl/: ناو. ئەمپوول: ١. شووشەیەکی چکۆلە و سەربەسراو کە دەرمانی تێدایە ٢. دەرمانی ناو شووشەکە ≡ ١و٢. آمپول

**ئامپیاڵە** / amp(i)yałe/: ☜ **هاوپیاڵە**

**ئامپێر** / ampêr/: ناو. یەکەی پێوانی توندیی و هێزی کارەبا ≡ آمپر

**ئامپێرپێو** / ampêrpêw/: ناو. ئامپێرمیتر؛ ئامێری پێوانی توندی و هێزی کارەبا ≡ آمپرسنج

**ئامپێرمیتر** / ampêrmîtr/: ☜ **ئامپێرپێو**

**ئامتا** / amta/: ☜ **هاوتا**

**ئامدەرس** / amders/: ناو. ئاواڵدەرس ≡ همکلاسی

**ئامراز** / amraz/: ناو. ئەمراز: ١. ئالاڤ؛ ئامارات؛ ئامێر؛ ئاموور؛ ئامیر؛ کەرستە؛ کەرەستە؛ کەرەسە؛ ئەسباب؛ کەل‌وپەلی تایبەتی بۆ جێبەجێ کردنی کارێک ٢. هۆ؛ بۆنە ‹شەڕی براکوژی ئامرازی دەستی دوژمنانی کوردستانە› ٣. *[ڕێزمان]* یەکەیەکی زمان کە واتای سەربەخۆی نییە، وەک (و؛ کە) ≡ ١. ابزار ٢. وسیلە ٣. حرف

▣ **ئامرازی پرسیار:** *[ڕێزمان]* وشەی پرسیار (وەک: چۆن، کەی، چەن، چی و ...) ≡ ادات استفهام

**ئامرازی شوبهاندن:** *[ڕێزمان]* وشەی چوان (وەک: وەک، وەکوو، چون، هەروەک، مینا و...) ≡ ادات تشبیه

**ئامرازی پێوەند:** *[ڕێزمان]* ئەو مۆرفیمانە دوو ڕستە یان دوو وشە پێکەوە دەبەستنەوە (وەک: و، لەگەڵ، وێڕای) ≡ ادات ربط

**ئامریسیوم** / amrîsyum/: ☜ **ئامریکیوم**

**ئامریکیوم** / amrîkyum/: ناو. ئامریسیوم؛ توخمی کیمیایی کانزا و ڕادیۆئەکتیڤ، بە ژمارەی ئەتومی ٩٥ و کێشی ئەتومی ٢٤٣، کە لە داشکانی ئورانیوم و پولۆتونیۆم لە سیکلۆترۆندا بەرهەم دێ ≡ آمریکیم؛ آمریسیم

**ئامڕا** / amřa/: ☜ **هاوڕێ**

**ئامڕاز** / amřaz/: ☜ **هاوڕاز**

**ئامڕایی** / amřayî/: ☜ **هاوڕێیی**

**ئامشۆ** / amşo/: ناو. ئاموشۆ؛ ئامۆشۆ؛ ئامەشۆ؛ ئامشەو؛ ئامەولوەی؛ هاتوچۆ؛ هاتوچوو. هەروەها: **ئامشۆ بوون؛ ئامشۆ کردن** ≡ آمدوشد

**ئامشۆکەر** / amşoker/: ☜ **ئاموشۆکەر**

**ئامشەو** / amşew/: ☜ **ئامشۆ**

**ئامک** / amik/: ناو. مەتی؛ مەتک؛ میمک؛ پوور: ١. پڵ؛ میمی؛ خۆشکی باوک ٢. خالتیک؛ خاماجی؛ خوشکی دایک ≡ ١. عمّه ٢. خاله

**ئاملکان** / amilkan/: چاوگ. دامالران (پێست) ≡ کنده شدن (پوست)

**ئاملکانن** / amilkanin/: چاوگ. داماڵین (پێست) ≡ کندن (پوست)

**ئامڵە** / amłe/: ناو. پارە؛ دراو؛ پووڵ ≡ پول

**ئامنان** / am(i)nan/: ناو. هاوین؛ تاوسان ≡ تابستان

**ئاموشۆ** / am û şo/: ☜ **ئامشۆ**

**ئاموشۆکەر** / am û şoker/: ناو. هاتوچووکەر؛ ئامشۆکەر ≡ در رفت‌وآمد

**ئامۆ** / amo/: ناو. ١. مام؛ مامە؛ مامۆ؛ برای باوک ٢. ئاموور ≡ ١. عمو ٢. خیش

**ئامۆزا** / amoza/: ناو. مامۆزا؛ منداڵی مام؛ برازای باوک ≡ عموزاده

**ئامۆزازا** / amozaza/: ناو. منداڵی ئامۆزا ☰ فرزند عموزاده

**ئامۆژگار** / amojgar/: ناو. ئامۆژیار؛ مۆژیار؛ مۆچیار؛ ئامووچیار؛ پەندێر؛ مۆچیاریکەر؛ نسحەتکەر ☰ اندرزگو

**ئامۆژگاری** / amojgarî/: ناو. ئامۆژیاری؛ ئامووچیاری؛ پەند؛ نسحەت ‹گورگ، ئامۆژگاری هەڵناگرێ «مەسەل»›. هەروەها: **ئامۆژگاری کردن** ☰ اندرز

**ئامۆژن** / amojin/: ناو. مامۆژن؛ مەمۆژن؛ ژنئاپ؛ ژنی برای باوک ☰ زن‌عمو

**ئامۆژە** / amoje/: ناو. کۆمەڵێ بنەمای فێرکاری سەبارەت بە بابەت، کەس یان ڕێبازێکی دیاریکراو ‹ئامۆژەی مەزهەبی؛ ئامۆژەی ئەخلاقی› ☰ آموزه

**ئامۆژیار** / amojyar/: ☜ ئامۆژگار

**ئامۆژیاری** / amojyarî/: ☜ ئامۆژگاری

**ئامۆش** / amoş/: ناوەڵناو. ئارام؛ بێدەنگ و لەسەرخۆ ☰ خاموش؛ آرام

**ئامۆشۆ** / amoşo/: ☜ ئامشۆ

**ئاموچیار** / amûçyar/: ☜ ئامۆژگار

**ئاموچیاری** / amûçyarî/: ☜ ئامۆژگاری

**ئامور** / amûr/: ناو. ئامبوور: ١. هەوجاڕ؛ هێش؛ تیردار؛ یارەق؛ باسکێش؛ ئاقیلە؛ ئارەق؛ ئیرەقە؛ ئێلەقە؛ ئالیکە ‹ئەگەر ئاموورت نەدزیبێ شانت بە قوڕ نابێ «مەسەل»› ٢. مووری گەورە؛ لەتی گەورەی کۆتە دار ☰ ١. خیش ٢. کُندەی بزرگ

**ئامونیاک** / amûnyak/: ناو. گازێکی بێ‌ڕەنگ و بۆگەنە لە تێکئاڵاویی هیدرۆژێن و نیترۆژێن بەرهەم دێ ☰ آمونیاک

**ئامویر** / amûyr/: ناو. ١. ئاموور ٢. ئامراز و ئەسپاب ☰ ١. خیش ٢. ابزار

**ئامە** / ame/: ناو. دایک؛ داڵک؛ دێ ☰ مادر

**ئامەد** / amed/: ناو. ئامەو؛ بەخت؛ بەخت و هات؛ ڕێکەوتی باش و دڵخۆشکەر ☰ شانس

**ئامەشۆ** / ameşo/: ☜ ئامشۆ

**ئامەو**[1] / amew/: ☜ ئامەد

**ئامەو**[2]: ناوەڵناو. ١. ئەهل؛ ژیر؛ هۆی بەختەوەری ‹منداڵەکانی یەک لە یەک ئامەوترن› ٢. خاوەن پیت و پیرۆزی ☰ ١. فهمیده ٢. مُبارک

**ئامەولوەی** / ame w l(i)wey/: ☜ ئامشۆ

**ئامەی** / amey/: چاوگ. هاتن ☰ آمدن

**ئامیار** / amyar/: ناو. هەواڵ؛ هاوکار؛ یاریدەر ☰ همکار

**ئامیاری** / amyarî/: ناو. هاوکاری؛ ئاریکاری؛ هاریکاری ☰ همکاری

**ئامیان** / amyan/: ناو. ئامێژە؛ ئامێژەن؛ هەوێن؛ مایەی پەنیر و ماست و ... ☰ پنیرمایە

⊡ **ئامیانی حەو مەنجەڵ شیر بوون:** *[کینایە]* زۆر ساختەچی و دەسبڕ بوون ‹کوڕە چۆن لەگەڵ ئەوە مامەڵەت کردووە؟ ئەو کابرایە ئامیانی حەو مەنجەڵ شیرە! بێ شک کڵاوی لە سەر ناوی› ☰ شارلاتان بودن

**ئامیاننەگرتوو** / amyannegirtû/: ناوەڵناو. لێق؛ نەگرساو (ماست) ☰ نبستە (ماست)

**ئامیتن** / amîtin/: چاوگ. تێکەڵ کردن؛ لێکدان؛ تێکەڵ کردنی چەن شت ☰ آمیختن

**ئامیتە** / amîte/: ☜ ئامێتە

**ئامیر** / amîr/: ☜ ئامێر

**ئامین** / amîn/: نزا. خوایە قبووڵی کەی ☰ آمین

**ئامیە** / am(i)ye/: ☜ ئامێتە

**ئامێتە** / amête/: ناوەڵناو. ئاوێتە؛ ئامیتە؛ ئامیە؛ تێکەڵ؛ تێکەڵاو؛ لێکدراو ‹ئامێتەن وە جزو ڕێزەی مەجنووندا/ حەیفەن ئاو بەرۆش وە توونای تووندا «مەولەوی»›. هەروەها: **ئامێتەیی** ☰ آمیختە

**ئامێر** / amêr/: ناو. ئامیر؛ ئەسپاب؛ ئامراز ☰ ابزار

**ئـامێرد** / amêrd/: نـاو. *[بـاوەڕی کـۆن]* مێردەزمــە؛ پیرهەڤۆک؛ جنۆکەی مرۆترسێن ⊑ غول بیابانی

**ئـامێز**[1] / amêz/: نـاو. ئـامبێز؛ هــەمێز؛ هــامبێز؛ باوەش؛ باوش: ١. سنگ و بەر ٢. ئەو ئەندازە لـە هەر شتێ کـە لـە نێـوان دوو دەسـتدا جێگـەی دەبێتــەوە ‹ئامێزێــک قەســەل، دوو بــاوەش گیــا «مەسەل»› ⊑ ١. آغوش ٢. بغل

**ئامێز**[2]: ئاوەڵناو. ئامبێز؛ تێکەڵ؛ تێکەڵاو ⊑ مخلوط

**ئامێژە** / amêje/: ☜ ئامیان

**ئامێژەن**[1] / amêjen/: ☜ ئامیان

**ئامێژەن**[2]: ئاوەڵناو. *[پلار]* ئامیتـە؛ تێکـەڵ ـ پێکـەڵ ‹ئای لە وڵاتی ئامێژەنمان!› ⊑ آمیخته

⊡ **ئـامێژەن کـردن**: تێکــەڵاو کــردن؛ دوو تشــت تەڤلهەڤ کرن؛ تێکەڵ کردنی شـتێکی بـاش لەگەڵ خراپ هەر لەو جنسە بۆ چاکتر بـوونی ⊑ بە هم آمیختن

**ئان**[1] / an/: نـاو. حان؛ عان؛ دەم؛ کات؛ نـا؛ وەخـت ‹شەو شەوی میعراجی شـاهی ئـەنبیا بـێ، وا دەبـێ/ بیپەرستێ، بەڵـکی سـوجدەی بـۆ ببـا هــەر ئانـە ڕۆژ «مەحوی»› ⊑ وقت؛ آن

**ئان**[2]: ئامراز. یان؛ یا ‹من ئان تۆ دەبێ یەکمان نیمەن بین/ هەردووکمان مـەن بـین، لـە عالـەم پـەن بـین «مەسەل»› ⊑ یا

**ئانوئون** / an û 'ûn/: نـاو. ١. نازونووز؛ ئاینوئۆین؛ ئانوئین ٢. فێڵ و تەڵەکە ⊑ ١. ناز و ادا ٢. مکـر و حیله

**ئانوئین** / an û 'în/: ☜ ئانوئون ـ١

**ئانا** / ana/: ئاوەڵکار. ئەمێستا؛ ئێسـتاکە؛ نووکـە؛ هەنووکە ⊑ هم‌اکنون

**ئانانـاس** / ananas/: نـاو. ١. ئاڵــفەگیای تایبــەتی گەرمیان، بە گەڵای ئەستووری دڕکاوی و گوڵـی بــە هێشــووی داهــاتووەوە ٢. میــوەی درشــتی خڕۆکەی ئەو گیایە کە گۆشتێکی ئاوداری ترش و شیرینی هەیە و دەخورێ ⊑ ١و٢. آناناس

**ئانتیبیۆتیـک** / antîb(i)yotîk/: نـاو. چڵــکبــەر؛ دەرمــانی وشــک کــردنی ڕیم و چڵـکی لـەش و کوشتنی میکروب ⊑ أنتی‌بیوتیک

**ئانتیک** / antîk/: ☜ ئەنتیکە

**ئـانتین** / antîn/: ناو. ئـانتێن: ١. ئـامێری گـرتنی شەپۆلی ئیلیکترۆمیغناتیسی ٢. *[کنایە]* هەواڵبەر؛ شۆفار؛ سیخوڕ ⊑ ١. آنتن ٢. جاسوس

**ئانتێن** / antên/: ☜ ئانتین

**ئانجـاخ** / ancax/: ئاوەڵکار. ئـەودەم؛ ئـەوجار ⊑ سپس

**ئاندرێشە** / and(i)rêşe/: ناو. ئەندرێشە؛ ئەندرێش؛ هەندرێشە؛ پیچک؛ پیچکە؛ گیایەکی پیازدارە، لە بنەماڵەی خوژە و سـووره بنـه، تـامی زۆر تیـژ و گازدارە، گـەڵاکانی درێـژ و سـێ‌سـووچە ⊑ پیـاز کوهی درنده؛ پیاز گل درشت

**ئاندوسـکۆپی** / anduskopî/: نــاو. نـــــاوبینی؛ هەناوبینی؛ کاری دیتنی کون و کەلێنی ناوەوەی لەش بە ئامرازی تایبەت ⊑ آندوسکپی

**ئانژین** / anjîn/: ناو. ١. دۆخی گەروو هاتن؛ هــەو کـــردنی نـــاودەم و گـــەروو ٢. بەرهـــەنگ؛ هەناسەتەنگی؛ هەست بـە گوشـار و خنکیـان ⊑ ١و٢. آنژین

**ئانفلۆئـانزا** / anf(i)lo'anza/: نـاو. ئەنفلۆئـــەنزا؛ پەرکەم؛ نەزلە؛ نوزلە؛ نەخۆشی تـاو و هەڵامـەت پێکەوە ⊑ آنفلوآنزا

**ئانقەس** / anqes/: ☜ ئانقەست

**ئانقەست** / anqest/: ئاوەڵکار. ئانقەس؛ لە قەسـت؛ لە قەستی؛ دەسانقەس ⊑ عمداً

**ئانک** / anik/: ناو. وانێک؛ شت؛ هین ⊑ چیز

**ئانکا** / anka/: ☜ ئێستا

**ئانکۆ** / anko/: ☜ ئانکو

**ئانکو** / ankû/: ئامراز. ئـانکۆ؛ ئـانگۆ؛ واتـە؛ یـانی؛

ئیدی ‹ئەز وی دناسم، ئانکوو نالێ منە› ☰ یعنی

**ئـانگژا / ang(i)ja/**: ئاوەڵـناو. ئـانگژە: ١. ئاوقـا؛ دەسـتەویەخە ٢. قەڵـس؛ تـووڕە ☰ ١. درگیـر ٢. عصبانی

⊡ **ئانگژا بوون**: ١. دەستەویەخە بـوون؛ بـە گـژدا چـوون ٢. تـووڕە بـوون ☰ ١. درگیـر شـدن ٢. عصبانی شدن

**ئانگژە / ang(i)je/**: ☜ **ئانگژا**

**ئانگوچک**[١] **/ anguçik/**: ☜ **ئەنگوچك**

**ئانگوچک**[٢]: ئاوەڵناو. قەڵس؛ تووڕە ☰ عصبانی

**ئانگۆ / ango/**: ☜ **ئانکو**

**ئانگۆر / angor/**: ناو. هاواڵ؛ هاوڕێ ☰ دوست؛ یار

**ئانگوو / angû/**: ناو. مێلاق؛ ئەو ترێیـە بـۆ زسـتان هەڵیدەواسن ☰ آونگ

**ئانوا / anwa/**: ☜ **ئەنوا**

**ئانوها / anuha/**: ☜ **ئێستا**

**ئانۆکا / anoka/**: ☜ **ئێستا**

**ئانە**[١] **/ ane/**: ناو. دایک؛ دالک ☰ مادر

**ئانە**[٢]: جێناو. ١. هۆوە؛ ئەوە ‹ئانەی بارە› ٢. ئـەمن؛ ئەز ☰ ١. آن ٢. من

**ئانەت**[١] **/ anet/**: ناو. ١. جۆرێ گیـا ٢. بـەری ئـەو گیایە ☰ ١. گیاهی است ٢. تخم آن گیاه

**ئانەت**[٢]: ئاوەڵـناو. سەرکەش؛ سـەربزێو؛ چڵـەک ☰ سرکش

**ئانـەتی / anetî/**: نـاو. سەرکەشـی؛ نافـەرمانی؛ یاخیگەری ☰ سرکشی

⊡ **ئانەتی کردن**: سەر بادان؛ سەرکەشی کردن ☰ سرکشی کردن

**ئانەو / anew/**: ناو. شێواز؛ بیچم ☰ طرح

**ئانەه / aneh/**: ئاوەڵـناو. یاریـدەر؛ هاوکـار ☰ یـار؛ کمک‌کننده

**ئانەهی / anehî/**: ناو. یارمەتی؛ ئاریکاری ☰ کمک

**ئانیسک / anîsk/**: نـاو. ١. هەنیسـک؛ ئانیـک؛ بەرەنیسکێ؛ نزگەرەی گریان ٢. ☜ **ئانیشـك** ☰ ١. هق ـ هق گریه ٢. ☜ **ئانیشك**

**ئانیشا / anîşa/**: جێناو. ئەوانە؛ وان ☰ آنها

**ئانیشـک / anîşk/**: نـاو. ئانیسـک؛ ئەنیشـک؛ هانیشک؛ هەنیشخ؛ هەنیشک؛ هەرەژنێ؛ بەنـدی نێوان قـۆڵ و باسـک ‹میـوانی خوشکێ، ڕۆن لـە ئانیشکێ «مەسەل»› ☰ آرنج

**ئانیشکە / anîşke/**: نـاو. ١. لەتـە لوولەیـەکی چـەماوە بـۆ لکانـدنی دوو لوولـە کـە لـە یـەک ئاراستەدا نەبێ ٢. دارێکی دوو پەل لـە ئاسـیاودا بەرداشی پێ بەرز و نزم دەبێتەوە ☰ ١. زانـویی ٢. زانویی آسیاب

**ئانیک / anîk/**: ☜ **ئانیسك ـ١**

**ئانین / anîn/**: چاوگ. هێنان؛ ئێنـان؛ هـاوردن ☰ آوردن

**ئـاو**[١] **/ aw/**: نـاو. ١. یـاو؛ ئـاوی؛ ئـاڤ؛ ئـەو؛ ئـاب؛ تراوێکی ڕوون، بێڕەنگ، بێتام و بێبۆنە، گیـانی هەموو گیاندارێکی پێ بەندە ‹ئاو لە گۆلاو بمێنـێ، گنخی دەبێ «مەسەل»› ٢. ئاو؛ ئاوی؛ ئاڤ؛ تـراوی پێکهێنەری زەریا و چۆم و کانی ‹ئاوی کانیاوێ کە وێنەنوێنە/ دلی خۆی داوەتێ، دلـبزوێنە «هـەژار، *بـۆ کوردستـان*»› ٣. *[مـەجاز]* زەریـا؛ چـۆم؛ چـەم؛ ڕۆ؛ ڕۆبار؛ ڕووبـار؛ هانـە؛ کـانی؛ گـۆم؛ گـم ‹ولاتـانی ئەوبەری ئاو› ٤. ئاو؛ ئاڤ؛ ئاوێ کە شتێکیان تێـدا کولاندووە ‹ئاوگۆشت› ٥. ئاو؛ ئاڤ؛ شیلە یا ئـاوی میوە و سەوزی ‹ئاوی گێزەر› ٦. ئاو؛ ئـاڤ؛ ئـاوی؛ ئاوێ کە میـوە یـا گیایـەکی تێـدا دەخووسـێنن ‹ئاوی هەنجیر› ٧. شاوەت؛ تۆمـاو؛ ئـاوی پشـت؛ ئاوی تێکەڵ بە ئیسپێرم لـە نێـری پێگەیشـتوودا ‹بە ڕۆچوونی ئاوێ دەکەی زیندەگی/ بە دەرچـوونی بایـەک دەبـێ مردنـت «مـەحوی»› ٨. *[مـەجاز]* فرمێسک ‹گەر نییە ئاور لە سینەمدا بە تاو/ بـۆچ لـە بەر قولقول غەریقی ئاو ئەز؟ «مـەحوی»› ٩. *[مـەجاز]*

بریقەی جواهیراتی وەک ئەڵماس و یاقووت ‹ئەو گەوهەری نوکتەی کە لە نالی دەدزن خەڵک/ ئاوی نییە، وەک ئاگری بێ شەوقی دزانە «نالی»› ⇐ ۱تا۹. آب

**ئاو چایکە:** ئاو چایی؛ ئاوی سارد؛ ئاڤا تەزی ⇐ آب خنک

**ئاو چایی:** ☜ **ئاو چایک**

**ئاو ژێر کا:** *[کینایە]* ۱. فێڵباز؛ داوباز ۲. ناڕاست؛ دووڕوو ⇐ ۱. حیلەگر ۲. مُنافق

**ئاوی حەیات:** ئاوی بەقا؛ ئاوی حەیوان؛ ئاوی ژیان؛ چاوگەیەکی خەیالییە، گوایە هەر کەس لێی بخواتەوە، عومری لە نوێ بۆ دەنووسن و جوان دەبێتەوە ⇐ آب حیات

**ئاوی خەزایی:** ئەو ئاوەی بە سەر گەنمدا دەیپرژێنن تا خەزایی بێنە سەری و کوللەی قوتار کەن ‹کوللەت کەوتە ناو شینایی/ بۆی بێنە ئاوی خەزایی «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ⇐ آبی کە برای جذب سار و دفع ملخ، بر گندمزار ریزند

**ئاو دەم:** لیک؛ لیکاوی زار ⇐ آب دهان

**ئاوی خواردن:** ئاوێ کە دەخورێتەوە ⇐ آبِ خوردن

**ئاوی رەش:** ئەوسێ؛ ئەوێسێ؛ شیناوی چاو؛ جۆرێک نەخۆشی چاوە، ئێش و کەم بوونەوەی سۆمای دەگەڵە و ئەگەر دەرمان نەکرێ کوێر دەکا ⇐ آب سیاه

**ئاو بە ئاو چوون:** ۱. تووک لێ کردن ۲. چوونێ کە گەڕانەوەی نەبێ ⇐ ۱. نفرین کردن ۲. رفتن بی‌بازگشت

**ئاو بە ئاورا کردن:** ۱. کوژانەوەی ئاور ۲. *[کینایە]* برینەوەی شەڕ و کێشە؛ کۆتایی پێ هێنانی ئاژاوە ⇐ ۱. خاموش کردن آتش با آب ۲. آب روی آتش ریختن

**ئاو بە ئاو کەوتن:** ۱. لە ناکاو گۆڕانی کەش و هەوا ۲. نەخۆش کەوتن بە هۆی گۆڕانی کەش و هەوا ⇐ ۱. مُنقلب شدن هوا ۲. دوهوا شدن

**ئاو بە بێژنگ کێشان:** *[کینایە]* کاری بێخۆ کردن ⇐ آب در هاون کوبیدن

**ئاو بە خۆدا کردن:** خۆ شوشتنی خێرا ⇐ دوش گرفتن

**ئاو بە دەستدا کردن:** *[کینایە]* لە حەددی ئەودا نەبوون ‹سەدی وەک ئەوکچەی مام ساڵە دەبێ ئاوی بە دەستدا کەن› ⇐ در حد (کسی/ چیزی) نبودن

**ئاو بەردان:** ۱. شێری ئاو کردنەوە ۲. شەڵەگە داشکاندن ۳. ڕاهی کردنی ئاوی ڕاوەستاو ⇐ ۱. شیر آب باز کردن ۲. برغاب را بستن ۳. آب را به جریان انداختن

**ئاو بەستن:** ۱. گونجەی ئەستێر ئاخنین ۲. شێری ئاو بەستن ۳. ئاو بە سەهۆڵ بوون لە سەرمادا ⇐ ۱. بستن راه آب استخر ۲. بستن شیر آب ۳. یخ بستن آب از سرما

**ئاو بە گونا کردن:** *[کینایە]* خزمەت و چاوەدێری کردن ‹منالداری ئاسان نییە، دە ساڵە ئاو ئەکاتە گون ئەو کوڕیا!› ⇐ خدمت و مراقبت کردن

**ئاو بە گون سەگا کردن:** *[پلار]* خزمەتی سپڵە کردن ‹دە ساڵە ئەیژی ئاو ئەکەمە گون سەگا ئیسە ئێژێ چەت کردگە؟!› ⇐ خدمت قدرناشناس کردن

**ئاو بە لچدا هاتنە خوار:** *[کینایە]* ئیشتیا کردنی زۆر ⇐ آب از لب و لوچە آمدن

**ئاو پا هاتن:** ☜ **ئاوی پێ داهاتن**

**ئاو پێدا دان:** ئاوکێشانی دەفری شۆڕاو ⇐ آب گرداندن/ کشیدن (ظرف)

**ئاو پێ لە گۆزە نەگران:** *[پلار]* کار نەزانین و دەستەوەستان بوون ⇐ دست‌وپاچُلُفتی بودن

**ئاو تاڵ و سوێر زۆر خواردنەوە:** *[کینایە]* سەختەتی

و ناخۆشی زۆر دیتن؛ بەئەزموون بوون ☰ سرد و گرم روزگار چشیدن

**ئاو تێزان:** ١. ئاڵوبۆڵ بوونی ترێی نەگەیشتوو ٢. ئاو کۆوە بوون لە دەمدا بە بۆنەی دیتنی شتی خۆش یان ترشەوە ٣. ئاو لە چاو هاتن بە هۆی پاک کردنی پیوازەوە ☰ ١. آبدار شدن قورەی انگور ٢. آب به دهان افتادن ٣. آب از چشم آمدن بر اثر پیاز

**ئاو جاوین:** *[کنایە]* گێل و گەوج بوون ☰ احمق بودن

**ئاو چنین:** ئاو گرتن ☰ آب چیزی را گرفتن

**ئاو چوون:** ئاو وشک کردن؛ قەت بوونی ئاو ☰ آب رفتن

**ئاو چەو دان:** چاوچنۆکی کردن؛ زەق ـ زەق ڕوانین ☰ چشم‌چرانی کردن

**ئاو خواردنەوە:** ئاڤ ڤەخارن: ١. ئاو خواردن ٢. *[کنایە]* قووڵ بوونی واتای قسەیەک ٣. *[کنایە]* ئاسان بوون ٤. *[کنایە]* خەرج هەڵگرتن ☰ ١. آب نوشیدن ٢. آب برداشتن ٣. آسان بودن ۴. خرج برداشتن

**ئاو خۆش کردن:** شیلەوگەرم کردنی ئاو ☰ ولرم کردن آب

**ئاو خەست کردنەوە:** *[کنایە]* ئاو لە ئاواندا/ دنگدا کوتان؛ ئاو هەسەو کردن؛ ئاو زەل دان؛ ئاش بێ ئاو نانەوە؛ کاری بیهوودە کردن ☰ آب در هاون کوبیدن

**ئاو داخستن:** ١. ئاو بەردانە ناو مەزراوە ٢. ئاوی جۆگەلە قەت کردن ☰ ١. آب به مزرعه هدایت کردن ٢. قطع کردن آب جوی

**ئاو داشتن:** ئاو دێران؛ ئاویاری کردنی زەوی ☰ آبیاری کردن

**ئاو داگرتن:** بوون بە ژێر ئاوەوە ‹ئاو هەموو مەزراکەمانی داگرت!› ☰ آب فراگرفتن

**ئاو دان:** ١. ئاو داشتن ٢. تێراو کردنی ماڵات ٣. تیخ سوور کردنەوە و بە ئاوا کردن بۆ ڕەقتر بوون ٤. داپۆشاندنی کانزا بە ئاوی کانزایەکی دیکە (وەک: زێڕ، زیو و...) بۆ خەملاندن یان بەرگری لە ژەنگ هێنان ☰ ١. آبیاری کردن ٢. سیراب کردن دام ٣. آب دادن تیغ ۴. آبکاری کردن

**ئاو دانە جەماڵی شتێکدا:** زاد لێ بڕین؛ بە یەکجاری نەهێشتن و تەواو کردنی شتێک ‹ئاویان دا بە جەماڵی شیرینییەکەدا و هیچیان نەهێشت!› ☰ لیس دادن؛ اثری از چیزی نگذاشتن

**ئاو دانیشتن:** *[کنایە]* زگ‌چوون؛ ئیسهال بوون ‹دوو ڕۆژە ئاو دادەنیشێ› ☰ اسهال بودن

**ئاو دەردان:** ١. ڕشتنی ئاوی ڕاوەستاو بە سەتڵ و دەفریتر ٢. ئارەق کردن ☰ ١. آب برکشیدن ٢. عرق کردن

**ئاو دە گون گەڕان:** *[کنایە]* بالغ بوون؛ پێ گەیشتن (کوڕ) ‹ئەرێ بابە، ئاوی دەگون گەڕاوە، داوای ژن دەکا!› ☰ بالغ شدن (پسر)

**ئاو دەماندن:** ئاو مژینی زەوی ☰ آب کشیدن زمین

**ئاو ڕژان:** ١. بەر بوونەوەی ئاو ٢. *[کنایە]* باو بوونی کارێکی زیاتر ناباو ‹بێ فائیدەیە مەنعی من ئێستاکە لە گریان/ بۆ عاشقی بێچارە زوو ئەم ئاوە ڕژاوە «نالی»› ☰ ١. آب ریختن ٢. مُد شدن

**ئاو ڕژاندن:** ١. بەر دانەوەی ئاو ٢. ئاو فڕێ دانی یەکسمی مێ، کاتی زایین ٣. *[کنایە]* باو کردنی کارێکی زیاتر ناباو ‹گەورە ئاو دەڕژێنێ، گچکە پای تێ دەنێ «مەسەل»› ☰ ١. آب ریختن ٢. پاره شدن کیسە آب دام مادە، هنگام زایمان ٣. مُد کردن

**ئاو ڕشتن:** *[کنایە]* میز کردن؛ میزتن ☰ شاشیدن

**ئاو زانە/ زاینە چاو:** چاو ئاو کردن؛ ئاو تێزانی چاو ☰ پر از اشک شدن چشم

**ئـاو زانـه/ زاینـه دەم:** ئـاو دە زار گـەڕان آب افتادن دهان

**ئاو زەل دان:** ☜ **ئاو خەست کردنەوە**

**ئاو فڕێ دان:** ۱. ئاو لـێ چـوونی مـایین کـاتی جووتخوازی ۲. *[پلار]* جنێوێکە بە ژنی سووکی دەڵـێن ۱. ترشـح ریخـتن مادیـان فحـل ۲. دُشنامی به زن هرزه

**ئـاو کردن:** ۱. ئاو لە چـاو هـاتن بـێ گریـان ۲. پەیدا بوونی زنچکاو لـە بـرین و کـوان ۳. ئـاو پرژاندن ۱. آب از چشم آمـدن ۲. آب کشـیدن زخم ۳. آب پاشیدن

**ئـاو کردنـە ژێـر کەسێ:** جێگـای کەسـێ لـە شوێنێک لێژ کردن و دەرکردنی کسی را از جایی دک کردن

**ئـاو گـرتن:** ۱. ئاوەنیـا کـردنی مـەزرا ۲. ئـاو تێ‌گەڕانی میـوە ۳. گوشـینی میـوە و گیـا ٤. هەڵبەستنی گۆل و ئەستێر بـە مەبەسـتی ئـاو داشتن ۱. آبسته کردن مزرعـه ۲. آبـدار شـدن میوه ۳. آبِ میوه گرفتن ۴. آب برای آبیاری ذخیـره کردن

**ئـاو لـە ئاشی دژمن کردن:** *[کیایە]* لـە قـازانجی دژمن جوولان آب در آسیاب دشمن ریختن

**ئاو لە ئاواندا/ دنگدا کوتـان:** ☜ **ئـاو خەسـت/ هەس کردنەوە**

**ئـاو لـە ئـاومڕۆ دەرکردن:** *[کیایە]* بـێ‌حـەیایی و سەرەڕۆیی لە ڕادەبەدەر کردن شـورش را در آوردن

**ئـاو لـە جێ مـاڵی کەسێ نـان/ دەرهێنـان:** *[کیایە]* مـاڵـی کەسـێ کـاول کـردن؛ قـوڕ بـە سـەری کەسێکدا کردن کسی را خانه‌خراب کردن

**ئاو لـە چـاو هێنـان/ سەندن:** ۱. *[کیایە]* زۆر تـۆخ یان تون و تیژ بوون ‹ئەو پیوازە ئاو لە چاو دێنێ› ۲. *[مەجاز]* ئاوی چاو چنین؛ لەو پەڕی جوانیـدا بوون ‹ماشینێکی پێیە هێندە جوانـە ئـاو لـە چـاو دێنێ› ۱. آب از چشـم آوردن (از تنـدی) ۲. آب چشم را گرفتن

**ئـاو لـە دەس نـەتکان:** *[کیایـە]* زۆر ڕژد بـــوون؛ چکووس بوون بسیار خسیس بودن

**ئـاو لـە کونەمێرولـە کـردن:** *[کیایـە]* خەڵـــک هرووژاندن مردم را شوراندن

**ئـاو لـە گیرفـان/ گیلفـان وەردان:** *[کیایە]* گیرفـان داتەکاندن؛ هـەموو پـووڵ و پارەیـەک خـەرج کردن جیب را خالی کردن

**ئاو لێ‌چوون:** تکە کردنی دیزە و مەنجەڵ و گۆزە و شتی ئاوتێکراو نم پس دادن (ظرف)

**ئاو لێڵ نەکردن:** *[کیایە]* هـیچ شـک و دوودڵـی تێدا نەبوون ‹مامەڵەی باشێکە، ئاو لێڵ ناکا؛ کاورا گەوجێکە، ئاو لێڵ ناکا› جای تردید نبودن

**ئـاو هاتنەوە:** شاوەت ڕژاندن؛ ڕەحەت بـوون آب آمدن

**ئاو هەسەو کردن:** ☜ **ئاو خەست/ هەس کردنەوە**

**ئاو هەڵکردن:** ئـاو بـۆ سـەرزەوی بـردن بـۆ ئـاو داشتن آبیاری کردن

**ئاو هەڵگرتن:** ۱. جۆگە ساز کردن بۆ ئاو هێنانە سەر زەوی لە سەر چاوەڕا ۲. هەڵـمژین و ئـاو تێدا کۆ بوونەوە ۳. مانا لێ بوونـەوە (قسـە یـان کارێ) ۱. جوی برداشتن ۲و۳. آب برداشتن

**ئاو هەڵگۆزین:** ☜ **ئاو هەڵێنجان**

**ئاو هەڵێنجان:** ئاو هەڵگۆزین؛ ئاو بە سەتڵ یـان دۆڵچە یان ئامانێک هەڵکێشان آب برکشیدن

**ئاو هێنـان:** ۱. ئـاو هـاوردنی چـاو ۲. ئەسـتوور بوونی لاقی یەکسم بە بۆنەی نەخۆشـییەوە ۱. آب آوردن چشم ۲. پاغره شدن ستور

**ئـاو هێنـان و دەس شۆردن:** *[کیایـە]* هـەر ئەوەنـدە بوون و نە هیچ شتێ زیاتر همین بودن و بس

**ئاو هێنانەوە:** دەسـپەڕ کـردن؛ جلـق لێـدان؛

مشته/ مشتاو کردن؛ بە دەس شاوەت هێنان ☰ استمناء کردن

**ئاوی بێ لەغاو خواردنەوە:** */کینایە، پلار/* سەرگری و بەرگری لێ نەکران و بە ئارەزووی خۆ جوولان ‹ئەو کورە دیارە ئاوی بێ لەغاوی خواردۆتەوە ئاوا سەرەڕۆیە› ☰ سرخود بار آمدن

**ئاوی پێ داهاتن:** */کینایە/* ئاو پا هاتن؛ زۆر ڕاوەستان ‹هەموو ڕۆژێ لەبەر سەیری بتی ئەو بەژنوبالایە/ لە سەر ڕێدا دەوەستم من، هەتاکوو ئاوی پێم دایە «ئەحمەد هەردی»› ☰ علف زیر پا سبز شدن

**ئاوی چاو بردن/ سەندن:** */مەجاز/* زۆر جوان و دلڕفێن بوون ☰ بسیار زیبا بودن

**ئاوی چاو چنین:** ☜ **ئاو لە چاو هێنان/ سەندن ـ٢**

**ئاوی چێشت زیاد کردن:** بۆ زۆر بوونەوە، ئاو کردنە ناو چێشتەوە ☰ آب به غذا بستن

**بونە ئاو:** ١. توانەوە؛ ئاتیوان؛ قاڵ بوون ٢. */مەجاز/* شەرمەزار بوون؛ تەریق بوونەوە؛ ئارەق دەردان لە خەجاڵەتدا ☰ ١. ذوب شدن ٢. شرمنده شدن

**چونە ئاو:** ١. کورت بوونەوە بە شۆران ٢. */مەجاز/* لەڕ و لاواز بوون ☰ ١. آب رفتن ٢. لاغر شدن

**لە ئاو دان:** لە چەم پەڕینەوە ‹بدە لە ئاو مەدە لە پردی نامەرد «مەسەل»› ☰ به آب زدن

**لە حەوت ئاو دان:** خاوەن ئەزموون بوون ‹لە حەوت ئاوی داوە، قولەپای تەڕ نەبووە! «مەسەل»› ☰ با تجربه بودن

**وەک ئاو زانین:** */کینایە/* زۆر شارەزا بوون لە شتێک ‹تورکی وەک ئاو دەزانێ› ☰ فوت آب بودن

**ئاوـ**[٢]: پێشگر. هاوـ؛ پێشگری هاوبەشی ‹ئاودەنگ؛ ئاوماڵ› ☰ هم ـ

**ئاوەنبار** / aw'enbar/: ☜ **هەماراو**

**ئاوا**[١] / awa/: ناوەڵناو. ئاڤا: ١. ئابات؛ ئاوەدان؛ ئاوان؛ ئاڤەدان؛ قەوغا؛ شوێنی پڕ ئاو و گیا یان لەبار بۆ کشتوکاڵ ‹ماڵی ئاوا کۆنە هاودەردم/ بە دوور بێ لە ئاهی سەردم «هەژار، *بۆکوردستان*»› ٢. پیوار؛ ون و نادیار ٣. ئاوها؛ ئاوەها؛ ئەئاوا؛ بەم جۆرە ‹هەڵوێستی ئاوا زۆر ئازانەیە؛ ئاوا شتێکم نەدیوە› ☰ ١. آباد ٢. گم و ناپیدا ٣. اینچنین

▣ **ئاوا بون:** ١. وندا بوون؛ لە بەر چاو نەمان ‹خەڵکی خۆریان کاتی ئێوارە کە لێ ئاوا ئەبێ / من بەیانی زوو لە چاوانم کە ون بوو ئافتاب! «شێخ ڕەزا»› ٢. ئاوەدان بوون/ بوونەوە ‹بە نووری عیلم و عیرفان/ ئاوا بێ وەتەنمان «بێکەس»› ٣. */کینایە/* مردن؛ لە دنیا دەرچوون ‹ڕۆیی ئەو «هێمن»ی زانا و بەڕێز/ مانگە ئاوا بوو لە گۆڤاری ئەدەب «ئاوات»› ☰ ١. افول کردن ٢. آباد بودن/ شدن ٣. مُردن

**ئاوا کردن:** ☜ **ئاوەدان کردن**

**ئاوا کردنەوە:** ☜ **ئاوەدان کردنەوە**

**ئاوا**[٢]: ئاوەڵکار. وا؛ ئاوەها ‹ئاوا هات و ئاوا چوو› ☰ چنین؛ اینچنین

**ئاوا**[٣]: جێناو. ئاوەها؛ وا ‹ویسالی بێ کەم و کەیفی حوزووی/ لە نالی گەر دەپرسی، یەعنی ئاوا «نالی»› ☰ چنین

**ئاوائاوایی** / awa'awayî/: ئاوەڵکار. هەنێن؛ ئاوهایی؛ بەو جۆرە ☰ آن‌طور

**ئاوات** / awat/: ناو. ئارەزوو؛ تاسە؛ هێڤی؛ هیوا؛ ئارزی؛ کەڵکەڵە؛ کەڵکەڵ؛ دڵخوازی؛ حەز ‹بێ بابیی تۆ بۆ من و تۆ بابی فوتووحە/ بێ بابیی تۆ خواستەیی من بوو، بە ئاوات «نالی»› ☰ آرزو

▣ **ئاوات پێکهاتن:** ئاوات هاتنە دی؛ بە ئاوات گەیشتن؛ بە هیوا گەیشتن ‹ئەگەر خەنجەر! بە خەنجەر پارەپارەت کەن لە سەر دەعوات/ نەڵێی

ئۆف! هەر بلێ ئۆخەی، کەوا ئاواتەکەم پێکهات!
«قانع»› به آرزو رسیدن

**ئاوات خواستن:** ☞ به ئاوات بوون

**ئاوات هاتنە دی:** ☞ ئاوات پێکهاتن

**بە ئاوات بوون:** ئاوات خواستن؛ ئاواتەخواز بوون؛ ئارەزوو کردن ‹بە ئاوات بووم ڕۆژێ بێیە لام› آرزومند بودن

**بە ئاوات گەیشتن:** ☞ ئاوات پێکهاتن

**ئاواتخواز / awatx(i)waz/:** ☞ ئاواتەخواز

**ئاواتەخواز / awatex(i)waz/:** ئاوەڵناو. ئاواتخواز؛ ئاواتەواز؛ ئاوەتەواز؛ بە ئارەزوو؛ بە تاسە؛ هیڤیدار؛ هیوادار؛ بە هەویا ‹بەهەشت کە پڕ بێ لە وشکەسۆفی/ ئاواتەخوازم کە لە سەقەر بم «بێکەس»›. هەروەها: **ئاواتەخوازی** آرزومند

**ئاواتەواز / awatewaz/:** ☞ ئاواتەخواز

**ئاوار[1] / awar/:** ناو. ١. کەلاوە؛ داروپەردوو؛ سەخمە؛ تەپسە؛ تەپاوکە؛ ئەوەی بە هۆی ڕووخانی دار و دیوارەوە بەجێ دەمێنێ ٢. هەڵوای ئارد و دۆشاوی وشک هەلاتوو بۆ زستان ٣. چایلێنەری ماڵ ١. آوار ٢. حلوای مخصوص زمستان ٣. آبدارچی منزل

**ئاوار[2]:** ئاوەڵناو. جودا؛ جیا جُدا

**ئاوارتن / awartin/:** چاوگ. هەلاوارتن؛ جودا کردن؛ لێک هەلاواردن مُتمایز کردن

**ئاوارتە / awarte/:** ئاوەڵناو. دوورخراوە؛ جیاکراوە؛ هاوێری مُتمایز

**ئاوارە / aware/:** ئاوەڵناو. ئاڤارە؛ ١. دەربەدەر؛ دەروەدەر؛ مشەخت؛ مەرزیر؛ بێلانە؛ بێهێلانە؛ ڕەبەق؛ بێئەنوا؛ بێماڵ؛ بێخانەولانە و جێگەی نیشتەجێ بوون ‹خاوەنماڵ دەری کردین و لەم سەرما و سۆلە ئاوارە بووین› ٢. تار؛ تەرە؛ بەرەزە؛ ئەودال؛ هەڵوەدا؛ ئەلوەدا؛ تێنوارە؛ پەرەوازە؛ پەرتەوازە؛ باشیل؛ بەرێدە؛ ترافیە؛ دوور لە ماڵ و زێدی خۆ ‹سەردەمێک ئاوارە بووم و ماوەییکیش دەسبەسەر/ نەمدی ڕووی ئاسوودەیی، هەر تووشی گێرە و قەرقەشم «هێمن»› ٣. سەرگەردان؛ دەرەندوو؛ بێپشتیوان ‹دە ساڵ ئاوارەی وڵاتانی بیانی بووم› ١تا٣. آواره

**ئاوارەیی / awareyî/:** ناو. هەڵوەدایی؛ دەربەدەری؛ دوور لە وڵاتی خۆ آوارگی

**ئاواری / awarî/:** ناو. کەرەستەی قاوە و چایی لێنان لوازم آبدارچی

**ئاواز / awaz/:** ناو. ١. گۆرانی؛ گورانی؛ ئڤاس؛ ستران؛ کۆت؛ زار؛ لاوک؛ کزە ‹ئاوازی حەسەن زیرەک› ٢. بەشێکی جیاواز لە دەسگاگەلی مووسیقای ئێرانی (بریتین لە ئیسفەهان، بەیاتی تورک، ئەفشاری، دەشتی و ئەبووعەتا) ٣. چریکە؛ جریکە؛ جیکە؛ دودەنگە؛ دەنگی پەلەوەر، بەتایبەت باڵندەی دەنگخۆش ‹ئاوازی بلبل› ١تا٣. آواز

**ئاوازنگ / awazing/:** ئاوەڵناو. ناوزڕاو رسوا

**ئاوازە / awaze/:** ناو. ١. دەنگ؛ ئاهەنگ ‹ئاوازەی زەنگۆلان دێ› ٢. ناوبانگ؛ دەنگ و ناو ‹ئاوازمش بەرز بێ جە گەردین شاران/ بلند کەردەبێ نام ناوداران «وەلی دیوانە»› ١. صدا ٢. شُهرت؛ آوازه

**ئاوازەخوان / awazex(i)wan/:** ☞ ئاوازەخوێن

**ئاوازەخوێن / awazex(i)wên/:** ناو. گۆرانیبێژ؛ دەنگبێژ؛ قامبێژ؛ سترانبێژ؛ ئاوازەخوان خواننده

**ئاواژوو / awajû/:** ☞ ئاواژی

**ئاواژی / awajî/:** ئاوەڵناو. ئاواژوو؛ بەراوەژوو؛ سەرەونخوون واژگون

**ئاواسی / awasî/:** ناو. ئەنگوچک؛ هەنگوچک؛ گوچک؛ سۆرانی؛ قۆلەکراسی فش و درێژ آستین بلند

**ئاواق / awaq/:** ئاوەڵناو. ١. واق ــ واق؛ چۆڵ و

بیابان ۲. چۆلکراوی بێئاوەدانی ☰ ۱. برهوت ۲. متروک

**ئاواک** / awak/: ناو. پەلپ؛ بیانوو؛ بیانک؛ وڕک ☰ بهانه

**ئاواڵ**[1] / awał/: ☜ **هاواڵ**

**ئاواڵ**ـ[2]: پێشوشە. هاوـ؛ هـامـ؛ هـاڤـ ـ (ئـاواڵزاڤا؛ ئاواڵدەرس) ☰ همـ ـ

**ئاواڵدامان** / awałdaman/: ☜ **ئاوەڵداوێن**

**ئاواڵدوانە** / awałd(i)wane/: ئاوەڵناو. هاواڵدوانە؛ ئاوڵدوانە؛ هاوسک؛ هاولف ☰ دوقلو

**ئاواڵدەرس** / awałders/: ☜ **هاواڵدەرس**

**ئاواڵزاوا** / awałzawa/: ☜ **ئاوەڵزاوا**

**ئاواڵکراس** / awałk(i)ras/: ☜ **ئاوەڵکراس**

**ئاواڵمنداڵ** / awałmindał/: نـاو. ئـاوەڵمـنـداڵ؛ جووت؛ جفت؛ یاوەرە؛ هەڤالۆک؛ هـژی، کۆمەڵـە ڕەگی هاوڕێی تۆل لە زگی دایکدا ☰ جُفتِ نوزاد

**ئاواڵە** / awałe/: ☜ **ئاوەڵا**

**ئاواڵەتی** / awałetî/: ☜ **هەواڵەتی**

**ئـاوان**[1] / awan/: نـاو. ۱. هاڤـن؛ هـاوان؛ هـاون؛ هەڤان؛ هەوەنگ؛ ئـاونگی دەسـکاونگ بـۆ شـت کوتان ۲. کرێ؛ مزە ۳. دەفـر؛ قـاپ و قاچـاغ ٤. بێفەڕی و ناڕاستی ☰ ۱. هاون ۲. مُزد ۳. ظروف ۴. کژی؛ نادرستی

**ئاوان**[2]: ئاوەڵـناو. ۱. ☜ **ئاوەدان** ۲. گوشاد؛ هـەراو ☰ ۱. ☜ **ئاوەدان** ۲. فراخ

**ئاواناسی** / awanasî/: نـاو. دەنگناسی؛ فونێتیـک ☰ آواشناسی

**ئاوانـاش** / awanaş/: ناو. مزاش؛ کرێی ئارد هاڕین کە ئاشەوان دەیسێنێ ☰ مُزد آسیابان

**ئاوانتـە**[1] / awante/: نـاو. فـێڵ؛ گـزی؛ تەشقەڵـە؛ حیلەوحەواڵە ☰ نیرنگ

**ئاوانتە**[2]: ئاوەڵناو. خـۆڕایی؛ مفـت؛ بـەلاش (شـتی ئاوانتە وەرناگرم) ☰ مُفت

**ئاوانتە**[3]: ئاوەلکار. بە خۆڕایی؛ مفـتی؛ بـە بـەلاش (ئاوانتە بردی!) ☰ مُفت

**ئاوانتەچی** / awanteçî/: ئاوەڵناو. ۱. مفتـەخۆر ۲. دەسـبڕ؛ فێڵـەباز و دەبـەکار ☰ ۱. مُفتخـور ۲. کُلاهبردار

**ئاواندن** / awandin/: ☜ **ئاڤاندن**

**ئاوانـدۆڵ** / awandoł/: نـاو. ئاواندۆڵـە؛ زنـدۆل؛ زەندۆل؛ بەردی گۆلاوان؛ قوولکە بەرد کـە ئـاوی تێدا کۆ دەبێتـەوە ☰ سـنگ گـودی کـە آب در آن جمع می‌شود

**ئاواندۆڵە** / awandołe/: ناو. ۱. ☜ **ئاوانـدۆڵ** ۲. دۆڵە؛ سوێنە؛ دەفـری هیربـاری جێگـای هـەویر شێلان ☰ ۱. ☜ **ئاواندۆڵ** ۲. ظرف خمیر

**ئاواندەساوان** / awandesawan/: ناو. دەسـکاونگ ☰ هاون و دستەاش

**ئاوانووسی** / awanûsî/: نـاو. فونێتیـک؛ کـاری نووسینی دەنگـەکانی زمانێـک بـە نیشـانەگەلی تایبەت ☰ آوانگاری

**ئاوانە** / awane/: ناو. نرخی ئاو؛ پوولی ئاو؛ ئاوبایی ☰ آب‌بها

**ئاوانی** / awanî/: ☜ **ئاوەدانی**

**ئـاواوۆک** / awawok/: ئاوەڵناو. چەقەسوو؛ چەنەباز؛ زۆربڵێ ☰ وراج

**ئاواهی** / awahî/: ☜ **ئاوەدانی**

**ئاواینە** / awayne/: ئاوەلکار. بەم جـۆرە؛ وەهـا ☰ این‌طور

**ئاوایی** / awayî/: ☜ **ئاوەدانی**

**ئاواییشین** / awayîn(i)şîn/: ئاوەڵـناو. ئـاکنجی؛ نیشتەجێ؛ سەقامگیر ☰ تختەقاپو

**ئاوبـاب** / awbab/: ناو. دوو یا چەند بـرا، خوشـک یان برا و خوشکی لە یەک باوک و دایک جیـا ☰ دو یا چند برادر و خواهر ناتنی از یک پدر

**ئاوبـارە** / awbare/: نـاو. ۱. ئـاوبوێر؛ بنەبەنگـە؛

قەمتەرە؛ داری درێژ و ئەستوور و کۆڵدراو کە بۆ پەڕاندنەوەی ئاو بە سەر کەندالیدا دەکێشن و دەبێتە جۆگە ٢. ئەو شیرەی کە هەنگ لە گوڵانی دەمژێ و دەیکاتە هەنگوین ٣. دیواری بەر ئاو بۆ بەرز کردنەوە و سەر خستنی بۆ شوێنی بەرز ☰ ١. قنطره ٢. شهد گُل ٣. دیوارک بالابر آب

**ئاوباز** / awbaz/: ناو. مەلەوان ☰ شناگر

**ئاوبایی** / awbayî/: ناو. ئاوانە؛ نرخی ئاو ☰ آب‌بها

**ئاوبردوو** / awbirdû/: ☜ ئاوبردە

**ئاوبردە** / awbirde/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* ئاوبردوو؛ تیاچوو؛ بە فیڕۆچوو ‹مەکەن لۆمەی من و کەزیەی بلاوی/ کە ئاوبردەی جوانی و ئاڵ و والاین «ئاوات»› ☰ بربادرفته

**ئاوبڕ** / awbiř/: ناو. ئاڤبڕ: ١. نەخۆشییەکی ئاژاڵە، لە خواردنەوەی ئاوی زۆر ساردەوە تووشی دێت ٢. شەلەگە؛ شەلیە؛ جێگەی دادڕین بۆ گوێزانەوەی ئاو ☰ ١. نوعی بیماری دام ٢. آب‌بند

**ئاوبوێر** / awb(i)wêr/: ☜ ئاوبارە ـ١

**ئاوبەدەمە** / awbedeme/: ناو. قوبوولی تەڕ؛ چێشتی قبوولی کە هێشتا ئاوی نەچنرابێ ☰ نوعی غذا

**ئاوبەر** / awber/: ☜ ئاوکێش

**ئاوبەرە** / awbere/: ناو. ١. ئەو کاروانە هەنگەی لە کاتی شانە هەڵبستندا دەچنە سەر کانیاو ئاو دەبەنە پلوورەوە ٢. ئەو هەنگە لە بەر بەرزەفڕی پلوورەی لێ گوم دەبێ ☰ ١. زنبورانی کە از چشمه آب به کندو می‌برند ٢. زنبوری کە به علت بلندپروازی راه کندو را گم می‌کند

**ئاوبەن** / awben/: ناو. ١. ئاوبەند؛ ئاڤزەلێلک؛ ئیسقایی؛ نەخۆشی زگ ئاوسان ٢. گونج؛ دەربیجەی کردنەوە و بەستنی ئاوی ئەستێر ☰ ١. استسقا ٢. دریچەی آب استخر

**ئاوبەند** / awbend/: ناو. ١. ئاوبەن؛ ئاڤزەلێلک؛ ئیسقایی؛ نەخۆشی زگ ئاوسان ٢. دیواری بەرگری ئاو ☰ ١. استسقا ٢. بند

**ئاوبەندی** / awbendî/: ناو. ئاوبەنی: ١. کاری کپ کردنی شت یان جێگایەک لە بەرانبەر نم دانەوەدا ‹ئاوبەندی لوولەکانی باش ئەنجام نەدابوو› ٢. ڕەوتێ کە دەبێتە هۆی کپ و کوێر بوونەوەی کون و کەلێنی دەزگایەکی نوێ ☰ ١و٢. آب‌بندی

**ئاوبەنی** / awbenî/: ☜ ئاوبەندی

**ئاوپاش** / awpaş/: ناو. ئاوپڕژێن؛ ئاوپژێن؛ دەفرێکی دەسکداری لوولەدرێژ کە سەرێکی کون-کونی پێوەیە و ئاوی پێ دەپرژێنن ☰ آبپاش

**ئاوپاشی** / awpaşî/: ناو. ئاوپڕژێن؛ ئاوڕشێن؛ گوڵنم؛ ئۆپشکن؛ ئاوڕەشە؛ کاری پژاندنی ئاو بە سەر شتێک، بەتایبەت زەوی و گوڵ و گیادا. هەروەها: **ئاوپاشی کردن** ☰ آبپاشی

**ئاوپاڵ** / awpał/: ناو. کەوگیر؛ موخل؛ مەفسک ☰ کفگیر

**ئاوپرژێن** / awpirjên/: ☜ ئاوپاشی

**ئاوپڕژێن** / awpiřjên/: ☜ ئاوپژێن

**ئاوپژێن** / awp(i)jên/: ناو. ئۆپشکن؛ ئاوپرژێن: ١. ئاوپاش ٢. کاری پژاندنی ئاو بە ڕووبەرێکدا بۆ خاوێنکاری ☰ ١. آبپاش ٢. آب و جارو

⊡ **ئاوپژێنی دڵ کردن**: *[مەجاز]* دڵ فێنک کردنەوە؛ بە هۆی ڕووداوێ، شتێکەوە زۆر خۆشحاڵ کردن ☰ بسیار خوشحال کردن

**ئاوپەڕ** / awpeř/: ناو. ١. زەنبوورەی ئاش؛ دارێکی کونکراوە لە بنی دۆلاشدا تا ئاوەکە بە تەوژم لە پەڕە بدا ٢. ئاوجز؛ برینی پەنەماوی کیم و زووخ هێناو ٣. کاتی شیلە بەستنی دەغڵ ☰ ١. وسیله‌ای در آسیاب آبی ٢. خیز؛ آب‌آوردگی زخم ٣. وقت شیره بستن غلات

**ئاوپەڕە** / awpeře/: ئاوەڵناو. ئاوەکی؛ لە ڕان بەجێماو ☰ از گله جا مانده

⊡ **ئاوپەرە بوون/ کەفتن:** لە ڕان و مێگەل تەرە بوون. هەروەها: **ئاوپەرە خستن** ⊏ از گلە تک افتادن

**ئاوپەڕێن** / awpeřên/: ئاوەڵناو. دژاو؛ تایبەتمەندی زەوییەک کە ئاو داشتنی دژوار بێ ⊏ ویژگی زمینی کە آبیاریش دشوار باشد

**ئاوپەنگ** / awpeng/: ناو. تالاو؛ پەنگاو ⊏ تالاب

**ئاوترسی** / awtirsî/: ناو. لە ئاو ترسان، کە بە هۆی نەخۆشی هارییەوە، مرۆ تووشی دێت ⊏ آب‌ترسی

**ئاوتێزاو** / awtêzaw/: ئاوەڵناو. بۆڵ؛ ئاڵ و بۆڵ؛ ئاو تێگەڕاو (میوە) ⊏ آب گرفتە (میوه)

**ئاوجا** / awca/: ناو. ئاوجە؛ هێوەرژن ⊏ جاری

**ئاوجاو** / awcaw/: ئاوەڵناو. گەوج؛ گەمژە؛ گێلۆکە ⊏ احمق

**ئاوجز** / awciz/: ناو. ئاودز: ١. قەڵشت و کەلێن کە ئاو بدەڵێنێ ٢. دۆخی هەڵماسینی برین و کۆ بوونەوەی کێم و زووخ تێدا ⊏ ١. آبزا؛ آبده ٢. خیز؛ آب‌آوردگی زخم

**ئاوجۆ** / awco/: ناو. ئابجۆ؛ ئابجوو؛ ئەوجوە؛ ئاوجەو؛ ئاوجوویە؛ مزەر؛ بیرە؛ خواردنەوەیەکە لە جۆ دروست دەبێ ⊏ آبجو

**ئاوجووت** / awcût/: ☜ **هاوجووت**

**ئاوجوویە** / awcûye/: ☜ **ئاوجۆ**

**ئاوجە** / awce/: ☜ **ئاوجا**

**ئاوجەو** / awcew/: ☜ **ئاوجۆ**

**ئاوچاو** / awçaw/: ناو. *[مەجاز]* ١. ڕووناکی؛ ڕۆشنایی؛ مایەی ڕۆشنایی و هۆی دیتن ٢. زات؛ بوێری (ئەم وشە بە تەنیا ناگوترێ) ⊏ ١. روشنی ٢. زَهره

⊡ **ئاوچاو دان:** *[مەجاز]* لە تەماشا کەیف کردن ⊏ از دیدن لذت بردن

**ئاو چاو سەندن/ سەنن/ گرتن:** *[مەجاز]* ترساندن و هێنانە ژێر فەرمانەوە؛ تۆقاندن و وزە و هێزی بەرهەڵست بوون لێ بڕین ⊏ ترساندن و مُطیع ساختن

**ئاوچن** / awçin/: ئاوەڵناو. ئاو چنراو؛ ئاو پێوە نەماو ‹قالییەکە ئاوچن بووە› ⊏ کاملاً خشک شدن

⊡ **ئاوچن کردن:** گوشین؛ ئاو گرتن؛ تەواو وشکەوە کردن ⊏ کاملاً خشک کردن

**ئاوچۆڕ** / awçoř/: ☜ **ئاوەچۆڕ**

⊡ **ئاوچۆڕ کردن:** ☜ **ئاوەچۆڕ کردن**

**ئاوخانە** / awxane/: ناو. *[کینایە]* ١. ئاودەست؛ ئاودەسخانە؛ ئاوڕێژ ٢. گۆزەڵە؛ دەفری چکۆلەی ژێر لانکەی مناڵ ⊏ ١. مُستراح ٢. لگن گهواره

**ئاوخوا** / awx(i)wa/: ☜ **ئاوخوێ**

**ئاوخواز** / awx(i)waz/: ئاوەڵناو. ئاوکێش؛ ئاوواز؛ تایبەتمەندی چێشتی سوێر یان زۆر چەور ⊏ آبکش (غذا)

**ئاوخوێ** / awx(i)wê/: ناو. ئاوخوا؛ ئاوی خوێ تێکراو ⊏ آب‌نمک

**ئاوخۆرە** / awxore/: ناو. ١. ڕەگی سەرەکی گیا و دار کە زۆر تەڕایی دەمژێ ٢. ئاوەن؛ ئاونە؛ لەنگەرە؛ بەندۆڵ؛ لیزۆک؛ لێزۆک؛ زەنبەلەک؛ ناوەڕۆکی لق کە تەڕایی ڕادەگوێزێ ٣. ئاوخۆرەوە؛ پەرداخ؛ لیوان؛ قومقومۆک؛ پیاڵە و شەربەی ئاو خواردنەوە ⊏ ١. آبخور درخت ٢. آوند گیاهان ٣. آبخوری

**ئاوخۆرەوە** / awxorewe/: ☜ **ئاوخۆرە ـ٣**

**ئاوخۆری** / awxorî/: ناو. ١. پەرداخ؛ شەربە؛ زەرک؛ لیوان؛ قومقومۆک؛ هەرچی ئاوی پێدەخۆنەوە ٢. دانەلغاو؛ ئەو ئاسنەی دەچێتە ناو دەمی یەکسمەوە ⊏ ١و٢. آبخوری

**ئاودار** / awdar/: ئاوەڵناو. ١. پڕئاو؛ ئاوار؛ پڕ لە کانی و ڕووبار (وڵات) ٢. پڕئاو (میوە) ٣. جەوهەردار (تیخ) ٤. بەهێز و کارا ‹زڵلەی ئاودار› ⊏ ١. پُرآب ٢. آبدار ٣. آبدیده ٤. آبدار

**ئاودارباشی** / awdarbaşî/: ☜ **ئاودارچی**

**ئـاودارچی** / awdarçî/: نـاو. ئابـدار؛ ئابدارباشـی؛ ئابدارچی؛ ئاودارباشی؛ کارگێڕی چاپەز و قاوەچی دیوەخان ☰ آبدارچی

**ئاودارخانە** / awdarxane/: ☜ **ئابدارخانە**

**ئـاوداری** / awdarî/: نـاو. تـەڕی؛ دۆخـی وشـک نەبوون ☰ آبداری

**ئاوداشتە** / awdaşte/: ئاوەڵناو. دێراو؛ ئاودێری کراو ☰ آبیاری‌شدە

**ئاودامـان** / awdaman/: ئاوەڵـناو. ئـاودامێن؛ ئاوداوێن: ١. داوێن‌شۆڕ (کراس یان کەوا) ‹کراسی شینی سادەی ئاودامان/ کە ئەیکەیتە بەر، ئـەچی بـۆ ناو ڕان «فولکلۆر»› ٢. شۆڕ هەتا داوێن (کراس یـان کەوا) ‹کراسێکی ئاودامانـی لەبـەر بـوو› ☰ ١. دامن بُلند ٢. بُلند

**ئاودامێن** / awdamên/: ☜ **ئاودامان**

**ئاوداوێن** / awdawên/: ☜ **ئاودامان**

**ئاودراو** / awd(i)raw/: ئاوەڵناو. ئاودێری‌کراو؛ تێراو بـوو ‹شـۆخی کـە ڕابیتـەی دەمەکـەی پـڕ لـە خەندەکـەی/ خونچـەی گوڵـی بـە ئـاوی حـەیات ئاودراومە «بێخود»› ☰ سیراب‌شدە

**ئـاودڕ** / awdiř/: نـاو. ئاڤـدڕ؛ ئاڤـدڕکە؛ ئاودڕکـە؛ ئاودڕگە؛ ئەو جێگەیەی کە ئاو دایدڕیوە ☰ آبکنـد؛ تکاب

**ئاودڕکە** / awdiřke/: ☜ **ئاودڕ**

**ئاودڕگە** / awdiřge/: ☜ **ئاودڕ**

**ئـاودز** / awdiz/: ناو. ئـاوەدز: ١. درز و قەڵشـتی ئاودەڵـێن ‹مەنفـەز و درز و ئـاودزی هەرچەنـد/ دەیگرم، دەیکوتم بە دەست و بـە پـێ «شـێخ ڕەزا»› ٢. ئاوجز؛ دۆخی کێم کۆ بوون ☰ ١. آبـزا؛ آبـدە ٢. خیز؛ آب‌آوردگی زخم

**ئاودزە** / awd(i)ze/: ناو. زنە؛ زوهۆڕ؛ لەرزک؛ زناو؛ زەوینێ کە هەمیشە تەڕە و ئاودەدەڵێنێ ☰ زمین آبزا

**ئاودوردڵ** / awdurdił/: ناو. ئاوردمڵ؛ زۆرخۆری ☰ پُرخوری

**ئـاودوزەک** / awduzek/: نـاو. ئـاودووزەک: ١. قەترەچەقان؛ لوولە شووشەی دەم‌تەنگ بە کڵاوی پەلاستیکییەوە، بۆ تکاندنی دەرمان ٢. شـرینقە؛ سرنگ؛ سرینگ ☰ ١. قطرەچکان ٢. سُرنگ

**ئاودووزەک** / awdûzek/: ☜ **ئاودوزەک**

**ئـاودەر** / awder/: ناو. ١. کەسێ کـە ئـاو دەدا بـە خەڵکی مەجلیس ٢. ☜ **ئـاودێر** ☰ ١. ساقی ٢. ☜ **ئاودێر**

**ئاودەس** / awdes/: ☜ **ئاودەست**

**ئاودەست** / awdest/: ناو. [کینایە] ئاوخانە؛ ئـاودەس؛ ئابدەسـت؛ ئابدەسـتخانە؛ ئاودەسـخانە؛ دەسـاو؛ حەوز؛ پێشاو ☰ مُستراح

**ئاودەسخانە** / awdesxane/: ☜ **ئاودەست**

**ئاودەڵ** / awdel/: ناو. پۆڕی نێر ☰ دُرّاج نر

**ئاودەڵێن** / awdełên/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی گۆزە و دیزەیێ کە تەڕایی دەداتەوە یا ئەسـتێرکێ کـە ئاوی لە درزانەوە لە بەر بڕوا ☰ دارای نشتی

**ئاودەنـگ**[1] / awdeng/: نـاو. هـاودەم؛ هـەواڵ؛ خەم‌ڕەوێن ☰ همدم

**ئاودەنگ**[2]: ئاوەڵناو. هاوبیر؛ هاوقسە ‹ئێمە لەم بارەوە ئاودەنگین› ☰ همفکر

**ئـاودەنگی** / awdengî/: ئاوەڵـناو. خـەم‌ڕەوێـن؛ هاودەنگ ☰ هم‌صحبت

**ئاودەنگیلـە** / awdengîle/: نـاو. هاودەنگیلـە؛ منداڵی هاودەنگ و سوکنایی‌دەر ‹بەشکوو خـودا منداڵێکیان بداتێ و ببێتە ئاودەنگیلـەیان› ☰ همـدم کوچولو

**ئاودیو** / awdîw/: ئاوەڵناو. ون؛ نادیار؛ شاراو ‹نـاوی ئەو بەرپرسانە ئاشـکرا دەکرێـت کـە پارەیـان ئـاودیو کردووە› ☰ مخفی

◻ **ئـاودیو کـردن:** شاردنەوە؛ لە بەر چاودا ون کردن ⇐ پنهان کردن

**ئاودێر** / awdêr/: ناو. ئاودەر؛ ئاویار؛ ئاوێر؛ کەسـێ کە زەوی و سەوزە ئاو دەدا ‹جەبباری بـێفتـووری سولتانی بێقسووری/ ڕەززاقی مار و مووری، ئاودێری دێمەکاری «حاجی قادر»› ⇐ آبیار

**ئاودێری** / awdêrî/: ناو. ئاویـاری؛ ڕەبـاس؛ کـاری گەیاندنی ئاو بە زەوی بە شـێوازی دەسـتکرد ⇐ آبیاری

**ئاور**[1] / awir/: ☜ **ئاگر**

▣ **ئاوری بن کا:** ☜ **ئاگری بن کا**

**ئاور**[2]: ناوەڵناو. ئاوس؛ زگپڕ ‹ژنی ئاور› ⇐ آبستن

**ئاورا** / awra/: ناوەڵناو. ئەورا؛ برسـی؛ برچـی؛ نێـز ‹ئاورای مەدقنە و سـێری مەجمنـە! «مەسـەل»› ⇐ گرسنە

**ئاورای** / awray/: نـاو. برسییەتی؛ برچینی ‹ئاورای مەزانوو چێش کەروو؟› ⇐ گرسنگی

**ئاورایێ** / awrayê/: ناو. برسییەتی ⇐ گُرسنگی

**ئاوربـاران** / awirbaran/: نـاو. ١. گـەرمای زۆری ڕۆژ ٢. شەڕ و تەقەی زۆر توند ⇐ ١و٢. آتش‌باران

**ئاورپەرسـت** / awirperist/: ناوەڵـناو. [کنایـە] ئاگرپەرست؛ گاور؛ زەردەشتی ⇐ آتش‌پرست

**ئاورجـا** / awirca/: نـاو. ئـاگردان؛ تـەزگا؛ تـەژگا؛ دەفری جێ ئاگر لە ئاتەشگادا ⇐ آتشدان

**ئاورچـەرخان** / awirçerxan/: نـاو. ئاورگــەردان؛ تاولەمـە؛ تاولـەمە؛ تـۆڕێکی لـە سـیم چنـراوی ناوچاڵە، دەسـکێکی زنجـیری هەیـە بـۆ زوخـاڵ گەشاندنەوە ⇐ آتشگردان

**ئاورخـان** / awirxan/: نـاو. ئاگرخـان؛ ئـارتوون ⇐ آتشخان

**ئاورخانـە** / awirxane/: نـاو. ١. ☜ **ئاگرخـان** ٢. ئاتەشـگا؛ ئاتەشـکەدە؛ ئاورگـە؛ ئاورگـا؛ ئایرگـا؛ ئاگرگــەی پــیرۆزی زەردەشــتیان ⇐ ١. ☜ **ئاگرخان** ٢. آتشکده

**ئـاوردان** / awirdan/: نـاو. پشـکۆدان: ١. ئاورجـا؛ تەژگا ٢. مەنگەڵـیە؛ مەنقـەل؛ کوانـوو ٣. وجـاخ؛ ئارگا؛ سێبەردەی کوانوو ⇐ ١تا٣. آتشدان

**ئاوردمڵ** / awirdmił/: ☜ **ئاودوردڵ**

**ئاوردن** / awirdin/: ☜ **هێنان**

**ئـاوردو** / awirdû/: نـاو. ئـاگردوو؛ سـووتەمەنی؛ سـووخت ‹هـەژار لێـی دەبـڕێ ئـاوردوو و زمهـەر/ کورووژمەی دەکا فەقیر، مالانگەڕ «هێمن»› ⇐ سوخت

**ئاوردە** / awirde/: ☜ **هاوردە**

**ئـاوردەمێن** / awirdemên/: نـاو. ئـاگردەمێن: ١. دەمنەی ئاسنگەری و مسـگەری ٢. کەسـێ کـە بەو دەمنە لە ئاور دەدەمێنێ ٣. ئاورگەشێن؛ ئـەو کەسە ئاور هەڵدەکا ⇐ ١. دم آهنگـری و مسـگری ٢. کسی که با دم می‌دمد ٣. کسی که آتـش را گیـرا می‌کند

**ئـاوردەی** / awirdey/: چاوگ. هێنان؛ هاوردن ‹تـۆ نەی کۆچەتدا، کار وێت کەردەن/ بەڵام ڕیشـەی مـن جە بێخ ئاوردەن «مەولەوی»› ⇐ آوردن

**ئـاورگ** / awirg/: نـاو. کوانـوو؛ وەجـاخ؛ ئـاگردان؛ تفک؛ کۆڕک؛ بندن؛ کوانگ ⇐ اُجاق

**ئاورگا** / awirga/: ☜ **ئاورخانە ـ٢**

**ئاورگە** / awirge/: ☜ **ئاورخانە ـ٢**

**ئاورگەردان** / awirgerdan/: ☜ **ئاورچەرخان**

**ئاورگەشێن** / awirgeşên/: ☜ **ئاوردەمێن ـ٣**

**ئاورنـگ** / awring/: نـاو. ئاورینـگ: ١. پریشـکە ئاگری وردیلە کە لە کوتانی ئاسـنی سـوورەوکراو دەپەڕێ ٢. برووسکە؛ ورشە؛ تریسکە ⇐ ١. اخگـر ٢. درخشش

◻ **ئاورنـگ دان:** ١. پریشـکە ئـاگر لـێبوونـەوە ٢. بریقە دان؛ بریسکان؛ برووسکین؛ ورشە دان ⇐ ١. شراره پراکندن ٢. درخشیدن

**ئاورۆچکە** / aw(i)roçke/: ☜ **ئاگرۆچکە**

**ئاوڕۆکە** / aw(i)roke/: ☜ **ئاگرۆچکە**

**ئاورە** / aw(i)re/: ناو. ئاگرە؛ ئایرە؛ جۆرێ زیپکەی تەڕە لە ڕوو دەردێت ☰ آتش پارسی

**ئاورەگڕە** / aw(i)reg(i)ře/: ناو. ئاگری بڵێسەبڵند ☰ آتش زبانەکش

**ئاوریشم** / awrîşim/: ☜ **هەورێشم**

**ئاوریشمفرۆش** / awrêşimf(i)roş/: ناو. قەزاز ☰ ابریشمفروش

**ئاوریل** / awrîl/: ناو. ئاپریل؛ ئاپریل؛ ئاڤریل؛ مانگی چوارەمی ساڵی زایینی کە ٣٠ ڕۆژە و لە ١٢ی خاکەلێوەوە دەستپێدەکا ☰ آوریل

**ئاورین** / awrîn/: ☜ **ئاگرین**

**ئاورینگ** / awrîng/: ☜ **ئاورنگ**

**ئاورێشمی** / awrêş(i)mî/: ناوەڵناو. کەژین؛ تەنراو لە ئاورێشم ☰ ابریشمی

**ئاوڕ** / awiř/: ناو. ١. هاوڕ؛ کاری لاکردنەوە و بۆ دواوە ڕوانین ٢. وەلام، جواو؛ پەرسڤ ☰ ١. واپس‌نگری ٢. پاسُخ

⊡ **ئاوڕ دانەوە**: ١. لا کردنەوە؛ ڕوو تێکردن؛ بۆ دواوە نواڕین ٢. *[کینایە]* بیرکردنەوە؛ تێفکرین ‹... لە سەر موجتەهید، لە سەر شێخ، لە سەر دەف، لە سەر زەرگ و مێخ، شەڕمان، گەڕمان ئەنایەوە، ئاوڕمان نەئەدایەوە! «هەژار، چوار *ناميلکە*»› ☰ ١. واپس نگریستن ٢. اندیشیدن

**ئاوڕ لێ دانەوە**: ١. بەرەو دوا لێ ڕوانین ٢. *[کینایە]* لاواندنەوە و چاکە دەگەڵ کردن ☰ ١. واپس نگریستن ٢. التفات کردن

**ئاوڕا** / awřa/: ناو. هاوڕێ؛ هاوبیر ☰ همراه؛ همفکر

**ئاوڕشێن** / awř(i)şên/: ☜ **ئاوپاشی**

**ئاوڕۆشنکەرە** / awřoşinkere/: ناو. ١. ئاوڕوونکەرە؛ ئاوڕوونکەرەوە؛ ئاوڕۆشنەوکەرە؛ ئاوەڕوونکەرە؛ مێرووەیەکی ڕەش ـ سووری چکۆلەیە بە سەر ئاوی لیخندا بە پەلە دێت و دەچێ ٢. *[کینایە]* بزۆز؛ بێئۆقرە؛ کەسێ کە هەر دێت و دەچێ و دانانیشێ ‹ئەوە چییە وەک ئاوڕۆشنکەرە هەر دیت و دەچی؟› ☰ ١. دبیب ٢. ناآرام

**ئاوڕۆشنەوکەرە** / awřoş(i)newkere/: ☜ **ئاوڕۆشنکەرە**

**ئاوڕوو** / awřû/: ☜ **ئابڕوو**

⊡ **ئاوڕوو بردن**: ئابڕوو بردن ☰ رسوا کردن

**ئاوڕوو چوون**: ڕووسیا بوون؛ ئابڕوو چوون ☰ رسوا شدن

**ئاوڕووبەر** / awřûber/: ☜ **ئاوڕووبەرە**

**ئاوڕووبەرە** / awřûbere/: ناوەڵناو. ئابڕووبەرە؛ ئابڕووبەر؛ ئاوڕووبەر؛ هۆی ئابڕوو چوون ☰ رسواکننده

**ئاوڕووت** / awřût/: ☜ **ئاوەڕووت**

**ئاوڕووداری** / awřûdarî/: ☜ **ئابڕووداری**

**ئاوڕوومەند** / awřûmend/: ☜ **ئابڕوودار**

**ئاوڕوونکەرە** / awřûnkere/: ☜ **ئاوڕۆشنکەرە**

**ئاوڕوونکەرەوە**/ awřûnkerewe/: ☜ **ئاوڕۆشنکەرە**

**ئاوڕەشە** / awřeşe/: ☜ **ئاوپاشی**

**ئاوڕەنگ** / awřeng/: ناو. جۆرێ ڕەنگی وێنەگەری کە بە ئاو دەگیرێتەوە ☰ آبرنگ

**ئاوڕیش** / awřîş/: ↓

⊡ **ئاوڕیش بوون**: *[کینایە]* ئاوقا بوون؛ تێکگیران ☰ درگیر شدن؛ گلاویز شدن

**ئاوڕێژ** / awřêj/: ☜ **ئاڤڕێژ-٢**

**ئاوڕێژگە** / awřêjge/: ناو. ئاوڕێژە: ١. شوێنی تێکەڵ بوون و ڕژانی ئاوی چەم بۆ ناو چەمێکی گەورەتر یان دەریا ٢. بەرزترین شوێنی یاڵ و کەژ کە ئاوەکەی بەم لا و بەو لادا دەڕژێ ☰ ١. مصب ٢. خطُالرأس

**ئاوڕێژنگە** / awřêjinge/: ناو. ڕێژاو؛ تاڤگە؛ ئاوهەڵدێر ☰ آبشار

**ئاوڕێژە** / awřêje/: ناو. ١. ☜ **ئاوڕێژگە** ٢.

ئـاوڕێژەک؛ گیاکتـک؛ سـمـلـەتیف 🇮🇷 ١. ☜ ئاوڕێژکە ٢. سُنبل‌الطیب

**ئاوڕێژەک** / awřêjek/: ☜ ئاوڕێژە ـ٢

**ئاوز** / awiz/: ☜ ئاوەز

**ئـاوزان**[١] / aw(i)zan/: چـاوگ. ئاوزیـان؛ ئـاوزین؛ فـامین؛ تێگەیشـتن ‹ئـەم منداڵـە نایـاوزێ› 🇮🇷 فهمیدن؛ درک کردن

**ئاوزان**[٢]: ناو. هێز؛ تاقەت؛ توانایی 🇮🇷 نیرو؛ توان

**ئاوزوونە** / awzûne/: ناو. ئاغزوونە 🇮🇷 سگک

**ئـاوزەنگی** / awzengî/: نـاو. ئـاوزەنگی؛ زەنگـوو؛ زنگی؛ وزەنگی؛ وێزەنگی؛ زەنگ؛ مەنەک؛ ڕکێف؛ ئالقەی نیوە جەغزی ئەم لا و ئەو لای زین کە لە کاتی سواریدا پێی تێ دەخەن ‹گەر بـە ئـاوزەنگی پەراسووی ئەم سەر ئەو سەر هەڵدڕم/ هێندە نـابزوێ بزانم ماوە یا خۆ مردووە «شێخ ڕەزا»› 🇮🇷 رکاب

⊡ **ئاوزەنگی تێ‌تەقاندن**: ☜ ئاوزەنگی لێدان

**ئاوزەنگی لێدان**: ئاوزەنگی تێ‌تەقاندن؛ لێخوڕینی ئەسپ بە ئاوزەنگی تێ‌کوتان 🇮🇷 رکاب کشیدن

**ئاوزەنگی‌تەقێن** / awzengîteqên/: ئاوەڵکار. خێرا؛ چوارناڵ ‹لەشکر ورووژا، سوار فـڕین فـڕین/ کەوتنـە شوێنی سوار ئاوزەنگی‌تەقێن «گۆران»› 🇮🇷 چهارنعل

**ئاوزیاگ** / awizyag/: ئاوەڵناو. ١. تەڕایی تێ‌گەڕاو؛ ئاو تێ‌زاو (میوە) ٢. [کینایە] تێگەیشـتوو؛ بـەئاوەز؛ ژیر 🇮🇷 ١. نیم‌رس (میوە) ٢. عاقل

**ئاوزیان** / awizyan/: ☜ ئاوزان[١]

**ئاوزین** / aw(i)zîn/: ☜ ئاوزان[١]

**ئاوزینـگ** / awzîng/: نـاو. ئاوەزینـگ؛ ئاویلکـە؛ گیانەلا؛ گیانەڵاو؛ دواهەناسە؛ دەمی مەرگ 🇮🇷 دمِ واپسین؛ احتضار

**ئاوزێم** / awzêm/: ناو. ١. کاتی ئـاو بـڕان؛ وادەی کەم بوونەوەی ئاو لە هاویندا ٢. ویشکەڕۆ؛ چۆمی وەرزی 🇮🇷 ١. هنگـام کـم شـدن آب در تابسـتان ٢. رودخانەی فصلی

**ئاوژی** / awjî/: ناو. ئاوی؛ تایبەتمەندی گیانەوەرێ کە لە ئاودا دەژی 🇮🇷 آبزی

**ئاوژیدان** / awjîdan/: ☜ ئاکواریوم

**ئاوس** / awis/: ئاوەڵناو. ئاڤس؛ هاوس؛ یـاوس: ١. ئاوڕ؛ سـکدار؛ زکپڕ؛ لەمەپـەڕە؛ تـۆل لـە زگ ٢. [مەجاز] بەردار؛ بەرهەمدار ‹بـای لـێ قـورس ئـەبێ داری ئاوس/ چەتر ئەنگێوێ ئەبێتە تاوس «هێـدی»› 🇮🇷 ١و٢. آبستن

⊡ **ئاوس بوون**: زک‌پڕ بوون ‹کانی دەزێـن بـە ئـاو و درەخت ئاوسن بە با/ شایی بەهارە، بولبولە داماد و غونچە بووک «نالی»› 🇮🇷 آبستن شدن

**ئاوس کردن**: ١. زک‌پڕ کردن ٢. [پلار] کەسـێک زۆر قەڵس و نارەحەت کردن بـە کارێـک یـان داوایەکـەوە 🇮🇷 ١. آبسـتن کـردن ٢. کسـی را عصبانی و ناراحت کردن

**ئاوسا** / awsa/: ☜ هاوسێ

**ئاوسار** / awsar/: ☜ هەوسار

**ئاوساگ** / awsag/: ☜ ئاوساو

**ئاوساڵ** / awsał/: ناو. تەڕەساڵ؛ ساڵـی پـڕباران و تەڕەتووشی 🇮🇷 آبسال

**ئاوسـان** / awsan/: چـاوگ. تێنەپـەڕ. //ئاوسـای؛ دەئاوسـێی؛ بئاوسـێ// ئاوسـیان؛ ئاوسـین: ١. هەڵامسان؛ ئەستوور بوون؛ پەنەمان؛ پەنـەمین ٢. هەڵچوونی نرخ؛ گران بوونی کـاڵا 🇮🇷 ١. آماسـیدن ٢. تورم شدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: ئاوسـاو/ چـاوگی نـەرێنی: نەئاوسان

**ئاوساندن** / awsandin/: چاوگ. تێپەڕ. //ئاوسـاندت؛ دەئاوسێنی؛ بئاوسێنە// ئاڤساندن؛ هەڵامسـاندن 🇮🇷 آماساندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەئاوساندن

**ئاوساو** / awsaw/: ئاوەڵناو. ئاوسـاگ؛ ئاوسـیاگ؛ پەنەماو؛ هەڵمساو 🇮🇷 آماسیده

**ئاوسی** / aw(i)sî/: ناو. ئاڤزی؛ زگپڕی؛ بـارداری ⚑ بارداری

**ئاوسیاگ** / awisyag/: ☜ **ئاوساو**

**ئاوسیان** / awisyan/: ☜ **ئاوسان**

**ئاوسین** / aw(i)sîn/: ☜ **ئاوسان**

**ئاوسێ** / awsê/: ☜ **هاوسێ**

**ئاوش** / awiş/: ☜ **باوەش**

**ئاوشار** / awşar/: ناو. ئاوشۆڕ؛ تافگە ⚑ آبشار

**ئاوشان** / awşan/: ☜ **هاوشان**

**ئاوشنگ** / awşing/: ئاوەڵناو. بێچوو مردووی شـیر وشک‌کردوو کە دیسان وە شیر بێتەوە (ئاژەڵ) ⚑ شیر خشک شده که دوباره شیر بدهد (دام)

**ئاوشۆڕ** / awşoř/: ☜ **ئاوشار**

**ئاوشە** / awşe/: ناو. شەونم ⚑ شبنم

**ئاوقا** / awqa/: ↓

⊡ **ئاوقا بـوون:** ئاوقە بوون؛ تێکەوە گلان و تـووش بوون ‹ڕۆژباشم ئەکرد لە کولـم و لێـوی/ ئاوقـایی دەمم بوو سەبرێ گەستم! «نـووری»› ⚑ گلاویـز شدن؛ درگیر شدن

**ئاوقـا کـردن:** ئاوقە کردن: ۱. ئاراستە کردن؛ بـۆ خستن؛ تێ‌گرتن ۲. تووش کـردن ‹هەلامـەتی بوو، ئاوقای منیشی کرد› ۳. هاندان بۆ شەڕ یـان هێرش بردن ‹سەگەکەی لێم کـس دا و ئاوقـامی کرد› ⚑ ۱. پرتاب کردن (به سوی چیزی) ۲. دچـار کردن؛ مُبتلا کردن ۳. وادار به حمله کردن

**ئاوقات** / awqat/: ناو. ئاوقاتی؛ پارێزەر؛ بریکـار ⚑ وکیل دادگستری

**ئاوقاتی** / awqatî/: ☜ **ئاوقات**

**ئاوقان** / awqan/: ☜ **هاوقان**

**ئـاوقۆرە** / awqore/: نـاو. گوشـراوی بەرسـیلە ⚑ آبغوره

**ئاوقە** / awqe/: ☜ **ئاوقا**

**ئاوقەد** / awqed/: ئاوەڵناو. ئامباز ⚑ گلاویز

**ئاوکە** / awke/: ناو. جۆرێ ترێ ⚑ نوعی انگور

**ئاوکێش**[۱] / awkêş/: ناو. ئاڤکێش؛ ئاوبـەر؛ سـەقا ⚑ سقّا؛ آبکش

**ئاوکێش**[۲]: ئاوەڵناو. ئاڤکێش؛ ئاوبەر؛ ئـاوخواز؛ ئـاوواز ⚑ آبکش

**ئاوکێشی** / awkêşî/: ناو. سـەقایی؛ کـاری ئـاو بـۆ مالان بردن ⚑ سقایی

**ئاوگۆشت** / awgoşt/: ناو. گۆشـتاو؛ ئـاو و گۆشـت؛ شۆربا و گۆشت ⚑ آبگوشت

**ئاوگـەردان** / awgerdan/: نـاو. ئاوگـەردێن: ۱. دەفرێکی کانزایی دەسکدارە ئاوی پێ لە مەنجەڵ هەڵدەگرن ۲. جەرخەتوو؛ جەرخەتوون؛ چەرخی دەسکدار بۆ ئاو هەڵێنجان ⚑ ۱. آبگـردان ۲. چـرخ چاه

**ئاوگەردێن** / awgerdên/: ☜ **ئاوگەردان**

**ئاوگەز** / awgez/: ئاوەڵـناو. خـراپ و پلیشـاو بـە هۆی ئاولێدانەوە (میوە) ⚑ آب‌گز

**ئـاوگیر** / awgîr/: نـاو. ۱. شـاگرد حـەمامچی ۲. کاری پرووشە کردن لە خـواردن تـا نـان و شـیو دێـنن ‹ئـاوگیرێکم کـرد، وزەم تێکەوتـەوە› ⚑ ۱. شاگرد حمامی ۲. چونه

**ئاوگیران** / awgîran/: ناو. دەمی ئاوەنیا کـردن ⚑ موسم کشت آبی

**ئاولک** / awlik/: ناو. بلۆق؛ تۆقلە ⚑ تاول

**ئاولەمە** / awleme/: ناو. ئاوەلەمە؛ بێچووی ناوزگ کە هێشتا خۆی بـاش نـەگرتووە ⚑ جنین هنـوز شکل نگرفته

**ئاولێژگە** / awlêjge/: ناو. ئاولێژنگە؛ تافگە ⚑ آبشار

**ئاولێژنگە** / awlêjinge/: ☜ **ئاولێژگە**

**ئاوڵ** / awił/: ناو. دۆلی چکۆلە ⚑ درّه‌ی کوچک

**ئاوڵاوی** / awławî/: ئاوەڵناو. ئاولـەڕوو؛ هاولـەڕوو؛ خوروێلکەدار؛ دەم و چاوی هاولاوی ⚑ آبله‌گون

**ئاوڵدوانە** / awiłd(i)wane/: ☜ **ئاواڵدوانە**

**ئاولکردار / awiłkirdar/:** ☜ **ئاوەڵکار**

**ئاوڵناو / awiłnaw/:** ☜ **ئاوەڵناو**

**ئاوڵە / awłe/:** ☜ **هاوڵە ـ١**

▣ **ئاوڵـە دەردان:** خوروێلکـە لـێهـاتن ≘ آبلـە درآوردن

**ئاوڵە کوتان:** هاوڵە کوتـان؛ خوروێلکـە کوتـان؛ سـێرۆمی هاوڵـە لـە سـەر پێسـت دانـان و دەرزیئاژن کردن و کڕاندنی، بـۆ بـەرگری لـە نەخۆشی هاوڵە ≘ آبلە کوبیدن

**ئاوڵەڕوو / awłeřû/:** ☜ **ئاوڵاوی**

**ئاوڵەفەرەنگی / awłefeřengî/:** ناو. هـاڵۆق؛ بـای بۆر؛ سفلیس ≘ سیفیلیس

**ئاوڵەگایانە / awłegayane/:** ناو. خورۆکـەی گـا؛ هاوڵەیەکە لە سەر گوانی مانگـا پەیـدا دەبـێ ≘ آبلەگاوی

**ئاوماس / awmas/:** ☜ **ماستاو**

**ئاوماڵ / awmał/:** نـاو. ١. شـەریک؛ هاوبـەش ٢. هاوسای زۆر نزیک ≘ ١. شریک ٢. همسایەی دیوار بە دیوار

**ئاوماڵک / awmałik/:** نـاو. ئاوماڵە؛ ئـەو چیلکـە و چاڵـەی لافـاو هاوردوویـە و داویەتـە کـەنار ≘ آبآوردە

**ئاوماڵـە / awmałe/:** نـاو. ١. هاوسـا؛ دراوسـێ ٢. ئاوماڵک ≘ ١. همسایە ٢. آبآوردە

**ئـاومرواری / awmirwarî/:** نـاو. مـروار؛ ماشـاو؛ ئاویسپی؛ ئەوئسبێ؛ ئەوێ ئسبێ؛ نەخۆشـییەکە نیسکەی چاو مات دەبێتەوە و بەرچاو لـێڵ دەکـا ≘ آب مروارید

**ئاومل[1] / awmil/:** ناو. لفی گـاجووت ≘ جُفـت گـاو شخمزنی

**ئاومل[2]:** ئاوەڵـکار. دەسـتـەملان؛ دەسـەوملان ≘ هماغوش

**ئاومیوە / awmîwe/:** نـاو. ئاومێوە؛ ئاوی هەرکام لە میوەکان (وەک: ئاوی پرتەقاڵ، ئـاوی تـرێ و...) ≘ آبمیوە

**ئـاومیوەگری / awmîweg(i)rî/:** نـاو. ١. کــار و ڕەوتی گــرتنی ئـاوی میـوە ٢. شـوێنی گـرتنی ئاومیوە ٣. پیشەی ئاومیوە گرتن ٤. کەرستەیەک کە ئاوی میوەی پێ دەگرن ≘ ١تا۴. آبمیوەگیری

**ئاومێوە / awmêwe/:** ☜ **ئاومیوە**

**ئاون / awin/:** ☜ **ئاونگ ـ١**

**ئاونگ / awing/:** ناو. ئاونگە؛ ئاوونگ: ١. هاونـگ؛ هـاوان؛ ئـاوان؛ ئـاون؛ ئاوانـە؛ هاڤـن؛ هـەوەنگ؛ هەونیگ؛ هەڤان؛ دنـگ؛ دینـگ؛ جـون؛ جـۆنی؛ جوون؛ جڕان؛ جەبل؛ تەقن؛ دەفرێکی گرۆڤـەری قووڵ لە برنجـە یـان بـەرد کـە شـتی تێـدا (بـە دەستەی ئاوان) دەکوتنەوە و دەیهاڕن ٢. ئاوەنگ؛ ئاهنگ؛ شەونم؛ خوناو ‹وێستاوە زەنگـۆڵ زەنگـۆڵ/ ئاونگ لە سەر پەلکی گوڵ « هێمن»› ٣. مێلاق؛ ئەو ترێیە کە بۆ زستان بە پەتییەوە هەڵدەواسن ≘ ١. هاون ٢. شبنم ٣. آونگ.

**ئاونگە / awinge/:** ☜ **ئاونگ**

**ئاونما / awn(i)ma/:** ناو. تراویلکە؛ بەردەتراویلکـە ≘ سراب

**ئاونە / awne/:** ناو. لوولەی نێرگەلە؛ لوولە قلیـان؛ میلاوقلیان ≘ میل قلیان

**ئاونەوات / awnewat/:** ناو. شەکرۆک ≘ آبنبات

**ئاووا / awwa/:** ئاوەڵناو/ ئاوەڵـکار. ئاوها؛ بەم جـۆرە ≘ چنین؛ اینچنین

**ئاوواز / awwaz/:** ☜ **ئاوخواز**

**ئاووتام / aw û tam/:** نـاو. چێشتی پیـازاو ≘ آش پیاز

**ئاووتاو / aw û taw/:** ناو. ئـابوتـاب؛ تـامولام ≘ آبوتاب

**ئاووخـاک / aw û xak/:** نـاو. *[مـەجاز]* سـەرزەمین؛ نیشتمان ‹وەک بەهەشت خەملیوە بـە گـوڵ/ نـەک

دڵـێک، بەڵـکە هــەزار دڵ// ئـاوبردەی ئاووخاکییــە/ گیرۆدەی خاکی پاکییە «ئاوات»› ≚ آب‌وخاک

**ئاووگڵ** / aw û giɫ/: نـاو. [مـەجاز] ١. ئەجــەڵ؛ هەنجەل؛ ئاکام؛ وادەی مەرگ ٢. سرشت؛ مایــە؛ چییەتی خۆیی و پێکهاتەی بنەمایی کـەس یـان شتێک ‹هەر چووینە نزیکی وان بە دیمـەن/ دیمـان نە لە ئاووگڵ وەکی مەن «هـەژار، مـەم و زیـن»› ٣. گۆڕ؛ خاک ‹کەس نازانێ ئاووگڵی کوێی بـە نەسـیب ئەبێ› ٤. دنیای مادی ‹گیان دەستی لە ئاووگڵ کە بەر بوو/ بە نیازی گەیشت و بەختـەوەر بـوو «هــەژار، مەم و زین»› ≚ ١. اجل ٢. سرشت ٣. گور ۴. دنیـای مادی

⊡ **ئاووگڵ هەڵگرتن:** چـۆڕایی و نم لـێ بـڕین؛ دوا دڵۆپ لێ تکاندنی ئـاوی شـتی تـەڕ ≚ کـاملاً خشک کردن

**ئاو و گۆشت** / aw û goşt/: ☜ **ئاوگۆشت**

**ئاوونگ** / awung/: ☜ **ئاونگ**

**ئـاو و هـەوا** / aw û hewa/: نـاو. کـەش و هــەوا؛ چۆنیەتی سەرما و گەرما و سـازگاری و ناخۆشـی مەڵبەند ≚ آب و هوا

**ئاوەبەند** / awebend/: ناو. وەند؛ بەند؛ سەد ≚ سد

**ئاوەتـا** / aweta/: نـاو. جۆمــەڕ؛ جۆگەڵـەی نێـوان تەختە و کەرد ≚ جوی میان کردوها

**ئاوەتەواز** / awetewaz/: ☜ **ئاواتەخواز**

**ئاوەچۆڕ** / aweçoř/: ئاوەڵناو. ئاوچۆڕ؛ وشک؛ نم لێ بڕاو ≚ نمگیر

⊡ **ئـاوەچۆڕ بـوون:** چۆڕایی و نم لێ بڕان؛ دوا دڵۆپ لێ تکانی ئاوی شتی تەڕ ≚ نمگیر شدن

**ئاوەچۆڕ کردن:** ئاوچۆڕ کردن؛ وشکەوە بـوون بـە تکانی دواچۆڕی تەڕایی ≚ نمگیر شدن

**ئاوەچۆڕە** / aweçoře/: نـاو. ١. ڕەوتی ئاو تکان لـە شتی تەڕ ٢. ڕەوتی باران بە دیواردا هاتنــە خــوار ٣. دۆخی ئاو لە بەر بەفر هەڵنیشتن ≚ ١. چکەی آب از جسم خیس ٢. شُرشُـر بـاران ٣. چکـەی آب از برف

**ئاوەخۆرە** / awexore/: نـاو. ئاوخۆرە؛ ئاوەڕۆکی دار یان لق ≚ مغز درخت یا ساقه

**ئاوەدان** / awedan/: ئاوەڵناو. ئاوا؛ ئاوان ≚ آباد

⊡ **ئاوەدان بـوون:** ئاوا بوون ‹بەوی چی مالی خەڵکی بێ‌خودان بێ/ کە ماڵە جوانەکەی ئەو ئـاوەدان بـێ «هێمن»› ≚ آباد بودن

**ئاوەدان بوونـەوە:** ئاوا/ ئاوان بوونەوە؛ دیسان سـاز کرانەوە ≚ آباد شدن

**ئـاوەدان کـردن:** ئـاوا/ ئـاوان کـردن: ١. خــانوو دروست کـردن؛ بنیـات نـانی خـانوو ٢. زەوی نەکێڵدراو چاندن ≚ ١. پی ریختن خانـه ٢. زیـر کشت بردن زمین بایر

**ئـاوەدان کردنـەوە:** ئـاوا/ ئـاوان کردنــەوە؛ پـاش وێرانی ساز کردنەوە ≚ دوباره آباد کردن

**ئاوەدانکـاری** / awedankarî/: نـاو. سـاز کـردنی خانووبەرە ≚ عمران

**ئاوەدانکەر** / awedanker/: ناو. ئاڤاگەر ≚ آبادگر

**ئاوەدانی** / awedanî/: نـاو. ئاوانی؛ ئاوایی؛ ئابـادی؛ ئاواهی: ١. شوێنێ کە ژیانی تێدایە ٢. گوند؛ دێ ≚ ١. آبادانی ٢. آبادی؛ روستا

**ئاوەدز** / awediz/: ☜ **ئاودز**

**ئاوەدەسـتخانە** / awedestxane/: نـــاو. [کیناپـــە] ئاودەس؛ کناراو ≚ مُستراح

**ئاوەر**[1] / awer/: ناو. بڕوا و متمانە ≚ عقیدە؛ باور

**ـ ئـاوەر**[2]: پاشگر. هێن؛ دابینکەر ‹نان‌ئاوەر› ≚ ـ آور

**ئاوەردە** / awerde/: ☜ **هاوردە**

**ئـاوەردەی** / awerdey/: چـاوگ. هێنــان ‹خــەیالان خاو ئـاوەردم بـەردم/ هـاوار جـە دەمـەی هەناسـەی سەردم «مەولەوی»› ≚ آوردن

**ئاوەرە** / awere/: ناو. ئاخوڕ؛ ئافڕ ≚ آخور

**ئـاوەڕا** / aweřa/: نـاو. کەنــداو؛ دڕنـاڵ؛ کەندالــی

دەسکرد لە نێوان دوو چەم یان دوو دەریادا بۆ هاتوچووی کەشتی 🇮🇷 کانال

**ئاوەڕۆ** / aweřo/: ناو. ڕەهەند؛ ڕەهەن؛ گۆنجە؛ ڕێگەی ئاوی پیس 🇮🇷 فاضلاب

**ئاوەڕووت** / aweřût/: ناو. ئاوڕووت؛ ئاوەکوڵ؛ مەلی سەربڕاوی بە ئاوی کوڵ ڕووتاوە 🇮🇷 آبروت

**ئاوەڕووتکراو** / aweřûtk(i)raw/: ئاوەڵناو. داڕووچای 🇮🇷 آبروت

**ئاوەڕوونکەرە** / aweřûnkere/: ☜ **ئاوڕۆشنکەرە**

**ئاوەڕێ** / aweřê/: ناو. ڕائاو؛ ڕێگای هاتوچووی گەمیە 🇮🇷 آبراهه

**ئاوەڕێژ** / aweřêj/: ناو. ڕەهەند؛ گونج؛ گۆنجە؛ ئاوەڕۆ 🇮🇷 فاضلاب

**ئاوەڕێس** / aweřês/: ناو. ڕێسراوی لووس و باریک 🇮🇷 رشتەی صاف و باریک

**ئاوەز** / awez/: ناو. ئاوز؛ ئاوەزان؛ هۆش؛ فام ‹لە دنیادا ڕەفێقیی پیاوی کەر هەرگیز نەکەی ئەحمەدا/ لە دەس ئینسانی بێ‌ئاوەز هەتا ئاخرسەرا ڕاکە! «ئەحمەد موختار جاف»› 🇮🇷 فهم؛ خرد

**ئاوەزا** / aweza/: ناو. ١. زۆنگ؛ زەنەک؛ زەوینێ کە ئاوێکی کەمی لێ هەڵدەقوڵێ و تەڕ و شلە ٢. ئاودز؛ ئاوجز؛ دۆخی کێم کۆ بوون 🇮🇷 ١. باتلاق ٢. خیز؛ آب‌آوردگی زخم

**ئاوەزان** / awezan/: ناو. فام؛ ژیری؛ عەقڵ پێ شکیان ‹ئاوەزانتان نەو خولکیان بکەن چایەک بخوەن؟› 🇮🇷 فهم؛ خرد

**ئاوەزوولک** / awezûlik/: ☜ **ئاوەزووڵك**

**ئاوەزووڵک** / awezûłik/: ناو. ئاوەزوولک؛ بلۆق 🇮🇷 تاول

**ئاوەزەنگی** / awezengî/: ناو. زەنگوو؛ ڕکێف؛ وزنگی؛ پلەکانی ئاسنیلەی سەرکەوتنی خوانی زین 🇮🇷 رکیب؛ رکاب

**ئاوەزەنگی‌کوت** / awezengîkut/: ئاوەڵکار. *[کنایە]* بەپڕتاو؛ بەلەز 🇮🇷 باشتاب

**ئاوەزیان** / awezyan/: چاوگ. ئاوەزیای؛ ئاوەزین؛ تێگەیشتن؛ خۆ ناسین 🇮🇷 بلوغ یافتن

**ئاوەزیای** / awezyay/: ☜ **ئاوەزیان**

**ئاوەزین** / awezîn/: ☜ **ئاوەزیان**

**ئاوەزینگ** / awezîng/: ☜ **ئاوزینگ**

**ئاوەزێ** / awezê/: ☜ **ئاوەزا-١**

**ئاوەزێڕ** / awezêř/: ئاوەڵناو. زێڕکفت؛ بە ڕووکێشی زێڕینەوە 🇮🇷 زراندود

**ئاوەزێو** / awezêw/: ئاوەڵناو. بە ڕووکێشی زێوینەوە 🇮🇷 سیم‌اندود

**ئاوەژوو** / awejû/: ئاوەڵناو. بەراوەژی؛ واژ؛ پشتوڕوو ‹ڕێوی کەولی خۆی ئاوەژوو دەکرد/ ژیشک کەولی مووی ئارەزوو دەکرد «سەیفی قازی»› 🇮🇷 وارونه

⊡ **ئاوەژوو بوونەوە:** لە بەرزایی سەرکەوتن و بە دیوی ئەودیودا داگەڕان 🇮🇷 سرازیر شدن؛ از بلندی به سمت پایین آمدن

**ئاوەژوو کردنەوە:** *[کنایە]* یەکجاری کردن؛ کوشتن ‹ڕمبێکی داهێنا، لە سەرڕا ئاوەژووی کردەوە› 🇮🇷 کُشتن

**ئاوەژوویی** / awejûyî/: ناو. ڤاجایی؛ پشتەوڕوویی 🇮🇷 وارونگی

**ئاوەژەنە** / awejene/: ناو. ئاوەشکێنە؛ کەلەبەرێک کە لە کاتی ئاش وێستاندا ئاوی ئاشی لێوە بەر دەدەنەوە 🇮🇷 آبریزگاه آسیا

**ئاوەژی** / awejî/: ئاوەڵناو. ئاوەژێ؛ ئاوی 🇮🇷 آبزی

**ئاوەژێ** / awejê/: ☜ **ئاوەژی**

**ئاوەسوو** / awesû/: ئاوەڵناو. ١. تایبەتمەندی بەردێک کە بە بۆنەی زۆر لە بەر ئاوەوە بوون لووس بووبێ ٢. عوزرنەشۆر؛ لە زگ وەستاو ٣. *[مەجاز]* گوێ‌نەدەر؛ بێ‌شەرم 🇮🇷 ١. آب ساب ٢. یائسه ٣. بی‌چشم‌ورو

**ئاوەسەر** / aweser/: ئاوەڵناو. شوێنە؛ تایبەتمەندی زەوینێ کە درەنگ ئاو دەخواتەوە 🇮🇷 ویژگی زمینی کە آب در آن دیر نفوذ کند

**ئاوەسێ** / awesê/: ناو. فەقیانە؛ ئەنگوچکە سۆرانی 🇮🇷 آستین بلند

**ئاوەش** / aweş/: ☜ باوەش

**ئاوەشکێنە** / aweş(i)kêne/: ☜ ئاوەژەنە

**ئاوەشی**[1] / aweşî/: ناو. نەخۆشی گوانی مەڕ کە ڕەق دەبێ و نادۆشرێ 🇮🇷 نوعی بیماری پستان میش

**ئاوەشی**[2]: ئاوەڵناو. باری بە ئاو کەوتنی دەغڵ لە بەر ئاو دانی زۆر ‹دەغڵەکەمان ئاوەشی بووە، خەریکە وشک دەبێ› 🇮🇷 آبگز

**ئاوەکوڵ** / awekuł/: ناو. ١. ئاوی کوڵهاتوو ٢. ☜ **ئاوەڕووت** ٣. کاری جل دە نێو ئاودا کوڵاندن 🇮🇷 ١. آب جوش ٢. ☜ **ئاوەڕووت** ٣. عمل لباس در آب جوشاندن

**ئاوەکی** / awekî/: ئاوەڵناو. ١. شل؛ تراو ٢. تەرە لە مێگەل 🇮🇷 ١. آبکی ٢. از گله جدا شده

**ئاوەلەمە** / aweleme/: ☜ ئاولەمە

**ئاوەڵ**[1] / aweł/: ناو. ١. ☜ هاواڵ ٢. نەخۆشی چۆکی ئاژەڵ 🇮🇷 ١. ☜ **هاواڵ** ٢. نوعی بیماری دام

**ئاوەڵ ـ**[2]: پێشوشە. هاوـ هەوال؛ نزیک و هاوڕێ ‹ئاوەڵداوێن؛ ئاوەڵ‌کراس› 🇮🇷 هم ـ

**ئاوەڵا** / aweła/: ئاوەڵناو. ئاواڵە؛ ئاوەڵە؛ وەکری؛ واز؛ گوشاد ‹ئەوا بۆی ئاوەڵایە باوەشی من/ بەسە بۆ من کە ئەو بێتە بەشی من «هێمن»› 🇮🇷 وا؛ گُشاده

**ئاوەڵانە** / awełane/: ناو. خەڵاتی شوان کە بەرخ و کاری تازەزاو لە دەشتەوە دێنێتەوە 🇮🇷 انعامی کە چوپان با آوردن نوزاد دام از صاحب آن می‌گیرد

**ئاوەڵدامان** / awełdaman/: ☜ ئاوەڵداوێن

**ئاوەڵداوێن** / awełdawên/: ناو. ئاوەڵدامان؛ ئاواڵدامان؛ ئاودامێن؛ ئاوداوێن؛ ئاودامان؛ داوێنی شۆڕ وەک کەوای مەلایان 🇮🇷 دامن بلند

**ئاوەڵزاوا** / awełzawa/: ناو. ئاواڵزاوا؛ هاواڵزاوا؛ هاوزاوا؛ هەڤاڵزاڤا؛ هەڤزاڤا 🇮🇷 باجناق

**ئاوەڵکار** / awełkar/: ناو. *[ڕێزمان]* ئاوەڵکردار؛ ئاوڵکردار؛ قەید؛ وشە یان دەستەوشەیێ کە بە کار یان ئاوەڵناو یان گوزارە، چەمکی کات، جێ، چۆنیەتی، ئەندازە و شتی وا دەبەخشێ (وەک: ئاکۆ خێرا ڕۆیشت. «خێرا» ئاوەڵکارە کە چۆنییەتی ڕۆشتنەکەی دەرخستووە) 🇮🇷 قید

**ئاوەڵکراس** / awełk(i)ras/: ناو. ئاواڵکراس؛ هاواڵکراس؛ هاوەڵکراس؛ هەڤاڵکراس؛ هاوڕێکراس؛ دەرپێی ژنانە 🇮🇷 شلوار زنانە

**ئاوەڵکردار** / awełkirdar/: ☜ ئاوەڵکار

**ئاوەڵمنداڵ** / awełmindał/: ناو. یاوەرە؛ جووت؛ هەڤالۆک؛ کۆمەڵەڕەگی هاوڕێی تۆڵ لە زگی دایکدا 🇮🇷 جُفت

**ئاوەڵناو** / awełnaw/: ناو. *[ڕێزمان]* ئاوڵناو؛ برینـاو؛ سیفەت؛ وشەیێ کە پێناسەی ناو دەکات و نیشاندەری چۆنیەتی یان چەندیەتییە (وەک: گوڵێکی جوان. «جوان» ئاوەڵناوە کە چۆنییەتی گوڵەکەی دەرخستووە) 🇮🇷 صفت

**ئاوەڵە** / awełe/: ☜ ئاوەڵا

**ئاوەماست** / awemast/: ☜ ماستاو

**ئاوەن** / awen/: ☜ ئاوخۆرە ـ٢

**ئاوەند و ڕەوەن** / awend û řewen/: ناو. ئاوەن و ڕەوەن؛ ئایەند و ڕەوەند؛ هاتوچۆی زۆر ‹من لە بۆ پێشوازی تۆی نازی زلە و ماقووڵشکێن/ کاولەیکی ئینفرادیم هەن بێ ئاوەند و ڕەوەن «کاکە ئەحمەد»› 🇮🇷 رفت و آمد

**ئاوەنگ** / aweng/: ☜ ئاونگ ـ٢

**ئاوەنوڕەوەن** / awen û řewen/: ☜ ئاوەندوڕەوەن

**ئاوەنوس** / awenûs/: ☜ ئابنوس

**ئاوەنیا** / awenya/: ناو. ١. ڕەپستە؛ دەغڵێ کە لە

پێشدا زەوییەکەی ئاو دراوە و شوو کراوە و دوایی تووی لێ‌چێندراوە ٢. ☜ کۆلۆەس ⩵ ١. آبستە؛ بساردە ٢. ٢. ☜ کۆلۆەس

⊡ **ئاوەنیا کردن:** دێران و ئامادە کردنی زەوی بۆ چاندنی دەغڵی ئاوی ⩵ آبستە کردن زمین

**ئاوەوەرە / awewere/:** ناو. ١. ئاوخۆرەوە؛ پەرداخ؛ شەربە؛ لێوان؛ گلاس؛ زەرکی ئاو خواردنەوە ٢. ڕاوی سەرکانی بۆ کورکور و کەو ⩵ ١. لیوان ٢. روشی در شکار پرندگان

**ئاوەها / aweha/:** ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. ئاوها؛ ئاوا؛ بەم جۆرە؛ بەم تەرزە ⩵ چنین

**ئاوها / awha/:** ☜ ئاوەها

**ئاوهایی / awhayî/:** ئاوەڵکار. هەنێن؛ بەو جۆرە؛ ئاوائاوایی ⩵ آن‌طور

**ئاوهەڵدێر / awhełdêr/:** ناو. تاڤگە؛ سووولاف «نێوان مانگی بەهاران وەختێ خێڵ بەرموژووران/ لە هاڕەی ئاوهەڵدێری کوێستانی سەر سنووران «فولکلۆر»» ⩵ آبشار

**ئاوی**[١] **/ awî/:** ناو. عابی؛ ئابی؛ شین؛ عاسمانی ⩵ رنگ آبی

**ئاوی**[٢]**:** ئاوەڵناو. عابی؛ ئابی: ١. بەراو؛ دژی دێم ٢. تایبەتمەندی جانەوەرێ کە لە ئاودا دەژی ٣. ئابی؛ شین؛ شینی ئاچخ؛ بە ڕەنگی ئاسمان ⩵ ١. آبی (زمین) ٢. آبزی ٣. آبی رنگ

**ئاویار / awyar/:** ☜ ئاودێر

**ئاویاری / awyarî/:** ☜ ئاودێری

■ **ئاویاری بارانی:** ئاودێریی بە شێوەی تنۆکەگەلی باران بە هۆی لوولەگەلی ئاو داشتنەوە ⩵ آبیاری بارانی

**ئاویاری دڵۆپەیی:** ئاو داشتن بە گوشاری کەمەوە لە لوولەگەلێکی باریکەوە کە ڕاست دەتکێتە سەر بنجکی دەغڵ و گیا ⩵ آبیاری قطره‌ای

**ئاویتن / awîtin/:** ☜ هاویشتن

**ئاویتە / awîte/:** ئاوەڵناو. ١. ئاوێتە؛ تێکەڵ؛ تێکەڵاو «چاوی کیژیش ئەمنی خستە ئەو گولە؟/ خۆشی ئاوێتەی گلە کوشتەی دڵە «هەژار»» ٢. لە زگدا مردوو ⩵ ١. آمیختە ٢. سقط شدە

**ئاویر / awîr/:** ☜ ئاگر

**ئاویژە**[١] **/ awîje/:** ☜ هیدرۆژن

**ئاویژە**[٢]**:** ئاوەڵناو. ئاوی؛ ئاویە؛ (زەوی) بەراو ⩵ آبی

**ئاویش / awîş/:** ناو. ئاوێش؛ دەرمان؛ دەوا ⩵ دارو

**ئاویشتن / awîştin/:** ☜ هاویشتن

**ئاویشەن / awîşen/:** ناو. چەوێر ⩵ آویشن

**ئاویلکە / awîlke/:** ناو. گیانەڵا؛ گیانەڵاو؛ سەرەمەرگ «ئێستا پیرم و کەوتوومەتە ئاویلکە/ چاوی جوانم لێ ون دەکا چاویلکە «هێمن»» ⩵ احتضار

**ئاویە**[١] **/ awye/:** ناو. ١. سواغ؛ سواخ؛ کاری قوڕ تێ‌هەڵسوونی بان و دیوار ٢. هلویە؛ جۆشی شتی کانزا ⩵ ١. گل‌اندود ٢. هویە

⊡ **ئاویە دان:** ١. سواغ دان؛ قوڕ تێ‌هەڵسوون و لووس کردنی بان و دیوار ٢. جۆش دان؛ لەحیم کردن ⩵ ١. گل لندودن ٢. هویە کردن

**ئاویە**[٢]**:** ☜ ئاویژە[٢]

**ئاوێتە / awête/:** ئاوەڵناو. ئاویتە؛ تێکەڵ ⩵ آمیختە

**ئاوێتەکاری / awêtekarî/:** ناو. تێکەڵ‌پێکەڵی: ١. شپرزی؛ شێواوی؛ شپرێوی ٢. دۆخی ئاوێتە بوونی چاک و خراپ ⩵ ١. آشفتگی ٢. درهم‌برهمی

**ئاوێتەیی / awêteyî/:** ناو. تێکەڵاوی؛ تێکەڵی؛ دۆخ یان چۆنیەتی تێکەڵ بوون ⩵ آمیختگی

**ئاوێر / awêr/:** ☜ ئاودێر

**ئاوێز**[١] **/ awêz/:** ناو. ئاوێزە؛ شروە؛ ئەو شتانەی بۆ ڕازاندنەوە هەڵیدەواسن ⩵ آویز

**ئاوێز**[٢]**:** ئاوەڵناو. داڵەقاو؛ شۆڕەوەبوو «تەماشای قەترەی دوڕ وێنەی واران/ ئاوێز بوو جە وەڵگ نەونەمای داران «بێسارانی»» ⩵ آویزان

• **ئـاویز**[۲]: پاشەوشە. ـ دالەقاو؛ ـ شۆڕەوەبوو؛ ئـاویزان کراو ‹سەرئاویز› ☰ ـ آویز

**ئـاویزان** / awêzan/: ئاوەڵناو. هەڵواسـراو؛ دالـەقاو؛ شۆڕەوە بوو ‹تەنافی زولفت ئاویزانـی بالات/ نـەمانی هاونەژادانت خەیاڵە «هەژار، *ئاڵەکۆک*»› ☰ آویزان

⊡ **ئـاویزان بـوون**: شـۆڕەوە بـوون؛ هەڵواسـران ☰ آویزان شدن

**ئـاویزان کردن**: هەڵواسـین ‹بـە قولەکـەی شـاهۆ ئـاویزانم کـەن/ تێکـەڵ وە بـاڵای نـازارانم کـەن «فولکلۆر»› ☰ آویزان کردن

**ئاویزە** / awêze/: ناو. ۱. ئاویز؛ شروە؛ ئەو شتانەی بۆ ڕازاندنەوە هەڵیدەواسن ۲. چلچرا؛ چرای چەند لق کە لە مزگەوت و ماڵەگەوراندا هەڵدەکرێ ۳. پێڵـە و سسلـەی خشڵـی ژنـان ☰ ۱. آویـزه ۲. چلچراغ ۳. زیور زنانه

ـ **ئاویژ** / awêj-/: ☞ **ـ هاویژ**

**ئـاویژران** / awêjran/: چـاوگ. ڤەشـەمڕان؛ بـڕک دران ☰ انداخته شدن

**ئـاویژراو** / awêjraw/: ئاوەڵـناو. بـڕک دراو ☰ انداخته شده

**ئـاویژە** / awêje/: نـاو. زەوی بـەراو؛ زەوی ئـاوی؛ بەرانبەری دێم ‹ئاویژە لە بەراو دەرچوون› ☰ زمـین آبی

**ئاوێستا** / awêsta/: نـاو. ئەوێستا؛ کتێبی پـیرۆزی زەردەشت ☰ اوستا

**ئاوێستایی**[۱] / awêstayî/: نـاو. ئەوێسـتایی: ۱. لـە زمانـە ئێرانییـە کۆنەکانـە، کـە کتـێبی پـیرۆزی ئاوێستا بەو زمانە نووسراوە ۲. خـەتی ئاوێسـتا ☰ ۱و۲. اوستایی

**ئاوێستایی**[۲]: ئاوەڵناو. ئەوێستایی؛ پێوەندیـدار یـان سەر بە ئاوێستا، کتێبی پیرۆزی زەردەشـتیان ☰ اوستایی

**ئاوێش** / awêş/: ☞ **ئاویش**

**ئاوێنە** / awêne/: ناو. ئاینە؛ ئایەنە؛ هـاوێن؛ جـام؛ قودیـک؛ ئـەینک؛ ئـەینووک؛ نـەینک؛ نـەینۆک؛ عەینک؛ قۆدی؛ مریـک؛ گـوزگی؛ هیلـی؛ هێلـی ‹ئەبێ یۆسف گەلێ مەمنوونی قانوونی غـەرامی بـێ/ کە ئاوێنەی جوانی ئەو دڵی شۆخی زولێخایە «قانع»› ☰ آینه

⊡ **ئاوێنەی بـاڵانوێن**: ئاوێنەی باڵاڕوان؛ ئاوێنەی بە قەد باڵای ئینسان کـە تـەواو قـەد بنوێنـێ ☰ آینەی قدی

**ئاوێنەی چاڵ**: ئاوێنەیەک کە ناوەکـەی قووڵـە و وێنە و ئاشۆپ ئەگەر زۆر لێ نزیک بێ گەورەی دەکاتـەوە و زۆریـش لـێدوور بـێ پچـووک نیشانی دەدا ☰ آینەی کاو/ مُقعر

**ئاوێنەی کۆم**: ئاوێنەی کووڕ؛ ئاوێنەیەک کە قوتە و وێنە یان ئاشـۆپ، چکۆلـەتر نیشـان دەدا ☰ آینەی کوژ/ مُحدب

**ئاوێنەی کوڕ**: ☞ **ئاوێنەی کۆم**

**ئاوێنەبەنـد** / awênebend/: نـاو. ژوورێـک کـە دیوارەکانی بـە ئاوێنـە ڕازاوەتـەوە ‹کۆشـکی ئاغـا گەچکارییـە، ئاوێنەبەنـدە/ کـەس نازانـێ بـە ژمـارە، پەنجەرەی چەندە! «گۆران»› ☰ آینەبند

**ئاه** / ah/: ناو. ۱. ئـاخ و داخ؛ هەناسـەی خـەمبار ‹هەم هەمعەنانی ئـاهم و هـەم هەمـڕیکابی ئەشـک/ ڕەحمێ بەم ئاه و ئەشکە بکە! هەسـتە بـێ قوسـوور! «نالی»› ۲. هێزی کەم ☰ ۱. آه ۲. رمق

⊡ **ئاهی نەگرتە**: دووبەختی؛ شانسی ☰ شانسی

⊡ **ئاه تێدا نەمان**: */کینایە/* لە کار و کەرەم کەوتن ‹ئیدی ئاهم تێدا نەماوە و ناتوانم لەگەڵتان بێم› ☰ از رمق افتادن

**ئاه هاتنەوە بەر**: */کینایە/* هاتنەوە سەر خۆ و هێز تێ گەڕانەوە ‹تۆزێک دانیشتم ئاهێکم هاتەوە بەر› ☰ جانی گرفتن

**ئـاهی دڵ شکاندن**: */مـەجاز/* تامـەزرۆیی شـکاندن

‹ترخێنێکمان بۆ لێنێ/ ئاهی دڵمان بشکێ «هەژار، *بۆ کوردستان*»› 🀄 شوق خوردن چیزی را بـرآورد کردن

**ئاهی کەسێ گرتن**: بە هۆی دۆعا و نزای کەسـێ، تووشی بەڵا بـوون ‹جەماڵـت ئـاهی مـن گـرتن خەتی سەبرت بە سەردا کەوت/ چەمـەن ڕابـورد و سەرما هات و تێکچوو نەوبەهاری تۆ «وەفایی»› 🀄 گرفتار آه کسی شدن

**ئاها** / aha/: دەنگ. ١. وشـەی ئاگـادار کـردن و وشیار کردنەوە ٢. نیشانەی سەر سووڕمان وێڕای وەرنەگرتن 🀄 ١. هان ٢. نە

**ئاهار** / ahar/: نـاو. ١. ئـاش؛ تـراوی نیشاسـتە، کەتیرە یان جەوی کە لە قومـاش یـان کاغـەزی هەڵدەسوون، ڕەپ و لووسی دەکا ٢. گوڵـەتیکە؛ گوڵەدەقاق؛ شەسپەڕەفەرەنگی 🀄 ١و٢. آهار

◘ **ئاهار لێدان**: دەق لێدان؛ ئـاش کـردن 🀄 آهـار زدن

**ئاهاردار** / ahardar/: ئاوەڵناو. ئاهاری؛ ئاهارلـێدراو 🀄 آهاری

**ئاهاری** / aharî/: 🖘 **ئاهاردار**

**ئاهای** / ahay/: دەنـگ. ئەی؛ هەی؛ هـای؛ هـۆی؛ ئوهۆی؛ هەرێ؛ هێی؛ هێست؛ وشەیەک بۆ ئاگادار کردنەوە یا بانگ کردن ‹ئاهای مام حـەولا! لەگـەڵ تۆمە!› 🀄 آهای؛ های

**ئاهر** / ahir/: 🖘 **ئاگر**

**ئاهرمەلـووچ** / ahirmelûç/: نـــاو. ڕیشۆڵـــــی؛ ڕەش‌چێلەک؛ ڕەشێلە؛ سێروو؛ گاوانی 🀄 سار

**ئاهرناک** / ahirnak/: ئاوەڵناو. ئـاگرین ‹چەنـدێوەن جە دین شای شەم دوور کـەفتم/ سـفتە و ئاهرنـاک، ساتێ نەسرەفتم «وەلی دێوانە»› 🀄 آتشین

**ئاهریمەن** / ahrîmen/: 🖘 **ئەهریمەن**

**ئاهرین** / ah(i)rîn/: 🖘 **ئاگرین**

**ئاهگە** / ahge/: 🖘 **ئاگە**[١]

**ئاهنگ** / ah(i)ng/: 🖘 **ئاونگ ـ٢**

**ئـاه و نالـە** / ah û nałe/: نـاو. کـاری ئـاخ هەڵکێشان و ناڵاندن ‹کە نادا مەحوی هیچ دادێ بە حاڵت/ بەسی بێ داد و ئاه و نالە، با بەس «مەحوی»› 🀄 آه و ناله

**ئاه و نزا** / ah û n(i)za/: 🖘 **ئاه و نزوولە**

**ئـاه و نزوولـە** / ah û n(i)zûle/: نـاو. ئـاه و نـزا؛ تووک و نەفرین؛ دوعای خراپ 🀄 نفرین

**ئـاهۆ** / aho/: نـاو. ١. پـەتا؛ درم؛ ئـازار؛ نەخۆشـی گیرا ‹دیق و زەردوویی و ئاهۆ و وەرهەم/ بـە گـژەی بای بە قەوەت دێـن بەرهـەم «سـوارە»› ٢. شـێتی؛ لێوەیی ٣. ئـاهوو؛ عـەیب و کەمایەسـی ٤. فـێ؛ پەرکەم؛ خووداری 🀄 ١. مرض واگیردار ٢. دیوانگی ٣. کاستی ۴. صرع

**ئاهۆن** / ahon/: 🖘 **ئەهوەن**

**ئاهـو** / ahû/: نـاو. ١. 🖘 **ئـاهۆ ـ٣** ٢. ئـاهی؛ ئاسک؛ کەژاڵ 🀄 ١. 🖘 **ئاهۆ ـ٣** ٢. آهو

**ئاهەڕا** / aheřa/: ناو. کوێرەڕێ؛ بزنەڕێ 🀄 کورەراه

**ئاهەک** / ahek/: نـاو. ئەهاک؛ قسڵ؛ قسـر؛ کلـس؛ کسڵ؛ کشل؛ زقل؛ سنجوف؛ ماکێکی سـپییە لـە بەردی ئاهەک بەرهەم دێ 🀄 آهک

◘ **ئاهەکی زیندو**: ماکێکی خـۆگر و سـپی ڕەنگـە کە لـە کـوورەی ئاهـەک‌پـەزی سـاز دەبـێ و هێشتا ئاوی لێ نەدراوە 🀄 آهک زنده

**ئاهەکی کوشتە**: تێکەڵاوی ئاو و ئاهەکی زینـدوو 🀄 آهک شکُفته

**ئاهەکی** / ahekî/: ئاوەڵناو. قسلی؛ قسری؛ کسلـی؛ زقلی؛ کشلی ‹زەوی ئاهەکی؛ کانیاوی ئاهـەکی› 🀄 آهکی

**ئاهەن** / ahen/: 🖘 **ئاسن**

**ئاهـەنگ** / aheng/: نـاو. ١. بـەزم و شـادی ٢. هەوای گۆرانی ‹ئاهەنگی ئەی ڕەقیبیان خوێند› ٣. دەنگ ‹وردەئاهەنگی دوای کۆخە نیشانەی ئەجەلـە!

«شێخ ڕەزا»› ٤. ڕێوڕەسم؛ بۆنە ‹ئاهەنگی نەورۆز›
⚐ ١. بزم ٢. آهنگ ٣. صدا ۴. جشنواره

⊡ **ئاهەنگ گێڕان:** بەڕێوە بردنی ڕێوڕەسم و بۆنەی شاد ⚐ جشن گرفتن

**ئاهەنگدار** /ahengdar/: ☜ **ئاهەنگین**

**ئاهەنگساز** /ahengsaz/: ناو. مووسیقاڕ؛ مۆسیقار؛ نەواچی؛ دەنگ‌نفیس؛ ئاوازدانەر؛ بەستەکار؛ هەوای ستران ڕێکخەر ‹عەلی مەردان ئاهەنگسازێکی بەناوبانگ بوو› ⚐ آهنگساز

**ئاهەنگسازی** /ahengsazî/: ناو. مووسیقاڕی: ١. کار و ڕەوتی ڕێکخستنی هەوای ستران ٢. پیشەی مووسیقاڕ ⚐ ١و٢. آهنگسازی

**ئاهەنگگێڕ** /ahenggêř/: ناو. بەڕێوەبەری ئاهەنگ و بۆنەی شاد ⚐ مُطرب

**ئاهەنگین** /ahengîn/: ئاوەڵناو. ئاهەنگدار؛ خاوەن ڕیتم و مێلۆدی ⚐ آهنگین

**ئاهیر** /ahîr/: ☜ **ئاگر**

**ئاهیرین** /ahîrîn/: ئاوەڵناو. ئاگرین؛ گەرم وەک ئاگر ‹نامەکەت یاوا کۆسم کەفتەوە/ دڵەی ئاهیرین دا وە نەفتەوە «مەولەوی»› ⚐ آتشین

**ئاهین** /ahîn/: ☜ **ئاسن**

**ئاهینگەر** /ahînger/: ☜ **ئاسنگەر**

**ئاهێر** /ahêr/: ☜ **ئاگر**

**ئاهێن**[1] /ahên/: چاوگ. نالین ⚐ نالیدن

**ئاهێن**[2]: ناو. ١. ☜ **ئاسن** ٢. ناڵە؛ ئاخ ⚐ ١. ☜ **ئاسن** ٢. آه

**ئاهێنگەر** /ahênger/: ☜ **ئاسنگەر**

**ئای**[1] /ay/: ئامراز. ئەی ‹ئای خۆزگە ببایە جێگە بۆ سانەوەیەک/ لەم ڕێگەیە دوورە سوور و پێچ دانەوەیەک «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ⚐ ای

**ئای**[2]: دەنگ. ١. ئاخ؛ ئۆف؛ هاوار لە ئێشان ‹ئای لاقم شکا!› ٢. وشەی سەیرمان ‹ئای لەو هەموو درۆیە!› ⚐ ١. آخ ٢. آی

**ئایئای** /ay'ay/: ئامراز. وشەی سەیرمان ⚐ وه وه

**ئایا** /aya/: ئاوەڵکار. داخۆ؛ داخۆم؛ تۆ بڵێی ‹زارم وەکوو هیلال و نەحیفم وەکوو خەیاڵ/ ئایا دەکەومە زار و بە دڵدا دەکەم خوتوور؟ «نالی»› ⚐ آیا

**ئایاکو** /ayakû/: ئاوەڵکار. ئایا؛ داخۆ؛ ئاخۆ ⚐ آیا

**ئایدیۆلۆجی** /ayd(i)yolocî/: ناو. جیهان‌بینی؛ کۆمەڵێک بیر و بڕوا کە دەبێتە سەرچاوە بۆ کار، ئاکار، چالاکی و چاوەڕوانییەکانی تاک و کۆمەڵگای مرۆڤ ⚐ جهان‌بینی

**ئایر** /ayir/: ☜ **ئاگر**

**ئایرگا** /ayirga/: ☜ **ئاورخانە ـ٢**

**ئایرناک** /ayirnak/: ☜ **ئاگرین**

**ئایرە** /ayre/: ☜ **ئاورە**

**ئایرین** /ay(i)rîn/: ☜ **ئاگرین**

**ئایسان** /aysan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //ئایسای؛ دەئایسێ؛ بئایسێ// هایسان؛ پێ بوونی ئاگر؛ گڕ بڵند بوون ⚐ مُشتعل شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ئایساو/ چاوگی نەرێنی: نەئایسان

**ئایساندن** /aysandin/: چاوگ. تێپەڕ. //ئایساندت؛ دەئایسێنی؛ بئایسێنە// پێ کردن؛ هەڵکردن؛ داگرساندن ⚐ برافروختن؛ مُشتعل کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەئایساندن

**ئایسە** /ayse/: ناو. ئەمێستا؛ ئێستا ⚐ الآن؛ هم اکنون

**ئایسین** /aysîn/: چاوگ. ١. هەڵواسین ٢. چەسپان؛ زەلقین ⚐ ١. آویختن ٢. چسبیدن

**ئای.سی.یو.** /ay.sî.yû./: ناو. بەشی پێ‌ڕاگەیشتنی تایبەتی لە نەخۆشخانەدا ⚐ آی.سی.یو.؛ بخش مراقبت‌های ویژه

**ئایش** /ayş/: دەنگ. ئاخ؛ ئۆف ⚐ آخ

**ئایشا** /ayşa/: جێناو. ئەوان؛ وان ⚐ ایشان

**ئایشەگوێدرێژ** /ayşeg(i)wêd(i)rêj/: ناو. *[باوەڕی*

*کون/* جنۆکەیەکە دایک منالی پێ دەترسێنێ ≋ لولو

**ئایفت** / ayift/: ئاوەڵناو. دەسکەوت؛ دەسهات ‹ئی ساڵ باخ هووچ ئایفتی نەو› ≋ عاید

**ئایفۆن** / ayfon/: ناو. دەنگبەر؛ نێوی بازرگانی ئامرازێکی کارەبایی بۆ پێوەندی نێو ماڵ و پشتی دەرکە و کردنەوەی دەرگا ≋ آیفُن

**ئایکناسە** / ayk(i)nase/: ناو. ئاقدەل؛ پۆڕ ≋ دُرّاج

**ئایل**[1] / ayil/: ناو. منداڵ؛ مناڵ؛ زارۆ ≋ بچە

**ئایل**[2]: ئاوەڵناو. ناهەقیکار؛ زاڵم ≋ ستمگر

**ئایلەمەل** / aylemel/: ☜ ئایلەمەن

**ئایلەمەن** / aylemen/: ناو. ئایلەمەل؛ ئاینەمەل؛ عەیلەمەن؛ ئاگرەمەلیچ؛ ڕیشۆڵی؛ خەزایی ≋ سار صورتی

**ئایم** / ayim/: ☜ ئایەم

**ئاین** / ayin/: ☜ ئایین

**ئایندە** / ayinde/: ناو. دواڕۆژ؛ داهاتوو ≋ آیندە

**ئاینوئۆین** / ayn û 'oy(i)n/: ناو. ١. ناز و نووز ‹خوداکەی! بەس کە بۆ دنیا ئەمەندە ئاینوئۆین/ تەماشا کە ئەحیبیا ساغ و ئۆیینچی هەموو ڕۆیین «مەحوی»› ٢. فێڵ و گزی ≋ ١. ناز و ادا ٢. مکر و فریب

**ئاینە** / ayine/: ☜ ئاوێنە

**ئاینەمەل** / aynemel/: ☜ ئایلەمەن

**ئاینی** / aynî/: ☜ ئایینی

**ئایە**[1] / aye/: ناو. ١. پوور؛ میمک؛ میمی ٢. ☜ ئایەت ـ١ ≋ ١. عمه ٢. ☜ ئایەت ـ١

**ئایە**[2]: ئاوەڵکار. ئاخۆ؛ ئایا ‹ئایە دەزانی؟› ≋ آیا

**ئایەت** / ayet/: ناو. ١. ئایە؛ هەرکام لەو بەشانەی قورئان کە ژمارەیەکی تایبەت بە خۆی هەیە ٢. نیشانە؛ گەوا ≋ ١. آیە ٢. نشانە

**ئایەتولکورسی** / ayetulkursî/: ناو. ئایەتی ٢٥٥ی سوورەی بەقەرە کە گوایا خوێندنی دەبێتە هۆی لادانی بەلا ≋ آیتُ‌الکُرسی

**ئایەخ**[1] / ayex/: ناو. ١. ئەیاغ؛ ڕەهەند؛ ئاوەڕۆ ٢. کارێز؛ کەرێز؛ ڕێگەی ئاوی بە ژێر زەویدا ≋ ١. فاضلاب ٢. کاریز

**ئایەخ**[2]: ئاوەڵناو. ئەیاغ؛ بێبرەو: ١. خراپ؛ چرووک ‹سەر نەوی ئەکەی بۆ گوڵێکی ئایەخ، کە خۆت شاگوڵیت؟! «پەشێو»› ٢. بێبایەخ ‹ئەو نووسەرەی نەدەبی بەرگری لە لا ئایەخ بووبێ، پێشمەرگەیشی لا بێبایەخ بووە› ≋ ١و٢. بی ارزش

**ئایەر** / ayer/: ☜ ئاگر

**ئایەرە** / ayere/: ناو. پێوانە ≋ پیمانە

**ئایەکو** / ayekû/: ئاوەڵکار. داخوا؛ داخۆ؛ ئایا ≋ آیا

**ئایەم** / ayem/: ناو. ئایم؛ مرۆ؛ مرۆڤ ‹ئایەم نەبایەد کەمتر بوود لە مووش/ مووشیش جی دیری لە ناو پرووپووش «شامی»› ≋ آدم

**ئایەند و ڕەوەند** / ayend û řewend/: ☜ ئاوەند و ڕەوەن

**ئایەنە** / ayene/: ناو. ١. داهاتوو؛ ئایندە ٢. ☜ ئاوێنە ≋ ١. آیندە ٢. ☜ ئاوێنە

**ئایهۆ** / ayho/: ☜ ئەیهۆ

**ئاییا** / ayya/: ناو. ئاییە: ١. مەت؛ پوور؛ خوشکی باوک ٢. دایک؛ دێ؛ ئەدا؛ داڵک ≋ ١. عمّە ٢. مادر

**ئاییسان** / ayîsan/: چاوگ. ئایسان؛ پێ بوونی ئاگر ≋ مُشتعل شدن

**ئایین** / ayîn/: ناو. ئاین: ١. مەزەب؛ دین؛ ڕەوشت ٢. ڕەسم؛ یاسا؛ ڕەسمویاسا؛ داب و دەستووری بەڕێوەبردنی بۆنەیەک، وەک: جێژن و زەماوەند و ... ≋ ١. دین ٢. آیین

**ئایینـدار** / ayîndar/: ئاوەڵناو. دینـدار؛ بەدین؛ بە ئایین؛ بەبڕوا؛ بڕوامەند بە دین و پێداگر لە سەر بەڕێوە بردنی داب و دەستووری دینی ≋ دیندار

**ئایینی** / ayînî/: ئاوەڵناو. ئاینی؛ دینی؛ پێوەندیدار

به ئایینەوە ‹قوتابخانەی ئایینی؛ مامۆستای ئایینی›
☰ دینی

**ئاییه** / ayye/: ☜ **ئایا**

**ئاییەی** / ayyey/: دەنگ. وشەی سەیرمان ☰ وە

**ئتلیس** / 'tlîs/: ناو. قیـز؛ قیزوبیـز؛ قێـز؛ قێزوبێـز؛ وەڕەزی ☰ بیزاری

**ئخ** / 'ix/: دەنگەناو. دەنگی هاویشتنی تف و بلـغەم ☰ اخ و تُف

**ئراز** / 'raz/: ناو. بوغز؛ ئوناق؛ گـیرانی گـەروو بـە هۆی خەم و خەفەتەوە ☰ بُغض

**ئربوڵ** / 'rbûł/: نـاو. بەیعانە؛ پێشـەکی سـەودا ☰ بیعانه

**ئرمس** / 'rmis/: ناو. ئەسرین؛ ئەسر ☰ اشک

**ئریشت** / irîşt/: ناو. هێرش؛ هەڵمەت ☰ یورش

**ئـزرەو** / 'zrew/: نـاو. سـیل؛ دەردەباریکـە؛ ئازارەباریکە ☰ سل

**ئزرەودار** / 'zrewdar/: ناوەڵناو. سـیلاوی؛ سـیلدار؛ سیار ☰ مسلول

**ئزگل** / 'zgil/: ناو. ئاور؛ ئاگر ☰ آتش

**ئزمەت** / 'zmet/: ناو. ڕێز؛ وەج ☰ حُرمت

⊡ **ئزمەت گرتن:** ڕێز گرتن/ دانان؛ قەدر گرتن/ لێ نان ☰ احترام گذاشتن

**ئسبڵ** / 'sbił/: ☜ **سپڵ**

**ئسپار** / 'spar/: ناو. تـەکمیش؛ کـاری وەرگێـڕانی زەوی ناو باخ به پێمەڕە ☰ عمل برگردانـدن زمـین باغ با بیل

**ئسپارەی** / 'sparey/: چاوگ. سـپاردن؛ ئەسـپاردن ☰ سپُردن

**ئسپل** / 'spil/: ☜ **سپڵ**

**ئسپیل** / 'spîl/: ☜ **سپڵ**

**ئسپێ** / 'spê/: ☜ **ئەسپێ**

**ئستران** / 'st(i)ran/: ناو. ستران؛ گۆرانی ☰ ترانه

**ئسترۆ** / 'st(i)ro/: ☜ **ئەسرۆ**

**ئستەیرک** / 'steyrik/: ☜ **ئەستێرە**

**ئستینک** / 'stînik/: ناو. ۱. زەردەواڵـە؛ هەنگەژاڵـە ۲. ژەنگەسوورە؛ سوورەمۆزە ☰ ۱. زنبـور ۲. زنبـور سُرخ

**ئستێرک** / 'stêrik/: نـاو. گـولاو؛ گـۆل ☰ اسـتخر کوچک

**ئستێڕک** / 'stêřik/: ناو. ئەستێڕک؛ هەرزاڵ؛ پێڕک؛ سەکۆی لە دار یان لە قوڕ لە ڕەشماڵ یان ژوور بۆ شت لە سەر دانان ☰ چوببست سکومانند

**ئسکام** / 'skam/: نـاو. ئیسـکان؛ ئیسـتیکان ☰ استکان

**ئش** / 'ş/: ناو. *[منداڵانە]* هەڵپەڕکێ ‹ئـش کـەرۆ بـالا بالا، نە کلاشش هەن نە پـالا/ تاتـەش ڕۆسـەمی زالا «فولکلۆر»› ☰ رقص و پایکوبی

**ئشتر** / 'ştir/: ☜ **وشتر**

**ئشک** / 'şk/: ☜ **وشك**[۱]

**ئشکار** / 'şkar/: ناو. ڕاو؛ ڕاڤ ☰ شکار

**ئشکاو** / 'şkaw/: ☜ **وشکاو**

**ئشکاوەی** / 'şkawey/: چاوگ. قەڵشـان؛ تلیشـیان ☰ شکافتن

**ئشکاویا** / 'şkawya/: ناوەڵناو. قەڵشـاو؛ تلیشـیاگ ☰ شکافته

**ئشـکاویەی** / 'şkawyey/: چـاوگ. قەڵشـاندن؛ تلیشانن ☰ شکافتن

**ئشکەف** / 'şkef/: نـاو. سـوێنە؛ تەشـتی سواڵـەتی هەویر تێدا شێلان ☰ تشت سُفالی خمیر گرفتن

**ئشکەفت** / 'şkeft/: ☜ **ئەشکەوت**

**ئشکەنجە** / 'şkence/: ☜ **ئەشکەنجە**

**ئشکێل** / 'şkêl/: ناو. چوارمێخـە؛ کـاری چوارپـەل بەستن و بە عەرزا دان ☰ چهارمیخ کشیدن

**ئڤاس** / 'vas/: ☜ **ئاواز-۱**

**ئقل** / 'qil/: ☜ **عەقڵ**

**ئگـەری** / 'gerî/: ناوەڵـناو. ئەگـەری؛ شـیمانە؛

شیمانی؛ دووبەختی؛ گاهەزی 🇮🇷 احتمالی

**ئله** / 'le/: ☜ هەڵۆ

**ئلەهە** / 'lehe/: ☜ ئلهِ

**ئلهِ** / 'lh/: ئامراز. ئلەهـە؛ بـا؛ دەبـا؛ ئامرازێکـە بـۆ جەخت کردن ‹ئلەهـ ئێ یێ ئەم هەڕن نـان بخـۆن› 🇮🇷 الاّ و بالله

**ئلهۆ** / 'lho/: ☜ هەڵۆ

**ئلهە** / 'lhe/: ☜ هەڵۆ

**ئلێمی** / 'lêmî/: ناو. ملپێچ؛ شـاڵ گـەردن 🇮🇷 شـال گردن

**ئم**[1] / 'm/: ئاوەڵکار. بەڵێ؛ ئا؛ ئەرێ 🇮🇷 آری

**ئم**[2]: دەنگ. دەنگێک بە نیشانەی نارەزایـەتی کـە زۆرتر لەگەڵ پووکاولە لێناندا دەگوترێ 🇮🇷 حـرف تنفر

**ئمجـا** / 'mca/: ئاوەڵـکار. ۱. ☜ ئنجـا ۲. دەی چیتر 🇮🇷 ۱. ☜ ئنجا ۲. دیگر چه

**ئمود** / 'mûd/: ناو. هیوا 🇮🇷 امید

**ئنجا** / 'nca/: ئاوەڵکار. ئمجا؛ ئەمجار؛ لەوە پاش 🇮🇷 سپس

**ئنجنار** / 'inc(i)nar/: نـاو. گیایـەکی دەسچێنـە، گوڵی مۆرە و بۆ دۆڵمە بە کاری دێـنن 🇮🇷 گیـاهی خوراکی

**ئندا** / 'nda/: ئاوەڵناو. وندا؛ بـزر؛ ون؛ گـوم 🇮🇷 گُـم؛ ناپیدا

**ئنشەک** / 'nşek/: نـاو. گیایـەکی خۆڕسـکە، لـە مووسیر دەچێ و دەخورێ 🇮🇷 گیاهی خوراکی

**ئنگرین** / 'ng(i)rîn/: چـاوگ. تـــووڕە بـــوون 🇮🇷 عصبانی شدن

**ئنە** / 'ne/: ناو. هەناسە 🇮🇷 نفس

**ئوبنـە** / ubne/: نـاو. ئوبنـەیی؛ قوونـەک؛ قنگـە؛ قنگدەر؛ پشتە؛ دوودەکی؛ نێری نێرخواز 🇮🇷 أبنه

**ئوبنەیی** / ubneyî/: ☜ ئوبنە

**ئوتـاخ** / utax/: نـاو. وەتـاخ؛ وەتـاغ؛ ئوتـاق؛ دیـو؛ ژووری دانیشتن 🇮🇷 أتاق

**ئوتاق** / utaq/: ☜ ئوتاخ

**ئوتوز** / utuz/: ئاوەڵناو. ئوتوس؛ تلار؛ تلـۆر؛ خـلار؛ گلۆر؛ گلێر؛ گولـۆر؛ بـە خـول؛ بـە گـل و خـول؛ خلخۆر؛ گلخۆر 🇮🇷 غلتان

**ئوتوس** / utus/: ☜ ئوتوز

**ئوتوماتیـک** / utumatîk/: ئاوەڵـناو. خۆمـەش؛ خۆبزێو 🇮🇷 اتوماتیک

**ئوتومبیل** / utumbîl/: ☜ ئوتومبێل

**ئوتومبێل** / utumbêl/: نـاو. ئوتومبیـل؛ ترومبیـل؛ سەیارە؛ ماشین 🇮🇷 خودرو

**ئوتۆ** / uto/: ☜ ئوتو

**ئوتۆپیـا** / utop(i)ya/: نـاو. بەختەشـار؛ کەسنەزاناوا؛ شاری ئاواتان 🇮🇷 اتوپیا

**ئوتو** / utû/: ناو. ئوتـۆ؛ وتـوو؛ تـووز؛ چـرچلابـەر؛ جلسافکەر؛ دەقاق؛ کەرەسەیەکە بـە پەڕەیـەکی ساف و کانزاییەوە کە داخ دەبێ، بۆ لابردنی چرچ و لۆچی قوماش و... 🇮🇷 اتو

**ئوتوبوس** / utûbûs/: ناو. پاس 🇮🇷 اتوبوس

**ئوتوز** / utûz/: ناو. ئوتووس؛ ئەتووز؛ تل 🇮🇷 غلت

▣ **ئوتوز بون:** تـل خـواردن؛ جاڵـە بـوون؛ بـەر بوونەوە پێـڕای تـل دان ‹بـەردێک لـە کێوەکـە ئوتووز بوو، دە چۆم کەوت و بەری ئاوی گـرت› 🇮🇷 غلتیدن

**ئوتوس** / utûs/: ☜ ئوتوز

**ئوجاخ** / ucax/: ☜ وجاخ

**ئوجاخکوێر** / ucaxk(i)wêr/: ☜ وجاخ کوێر

**ئوچ** / uç/: ناو. قامیشی قەڵەم 🇮🇷 قلم نی

**ئوچک** / uçik/: ناو. هووچک 🇮🇷 آستین بلند

**ئوختاپوس** / uxtapûs/: نـاو. هەشـتپا؛ هەشـپا 🇮🇷 هشتپا

**ئودکولون** / udkulun/: نـاو. تێکەڵی عەتر و ئەلکول و ئاو کە دەبێتە تراوێکی بۆنخۆش 🇮🇷 اُدکُلُن

**ئور** / ur/: ناو. ڕیخۆڵە ⇐ رودە

**ئورانوس** / uranûs/: ناو. حەوتەمین گەڕۆکی گەردوونەی خۆر (لە باری دووری لە خۆرەوە) ⇐ اورانوس

**ئورانیوم** / uranyum/: ناو. توخمی کیمیاوی کانزایی و ڕادیۆئەکتیڤ، لە دەستەی ئاکتینیدەکان بە ژمارەی ئەتومی ٩٢ و کێشی ئەتومی ٢٣٨,٠٢، قورس و زیوئاسا، لە سروشتدا بە شێوەی لێکدراوە هەیە ⇐ اورانیم

**ئورتودۆکس** / urtudoks/: ناو. ١. کەسێ کە پەیڕەوی کلێسەی ئۆرتۆدۆکسە ٢. ئەوەی شۆنەڕای ڕێوڕەسمی کۆنە ⇐ ١و٢. أرثُدکس

**ئورتۆپێد** / urtopêd/: ناو. ئێسکبژیشک؛ بژیشکی پسپۆڕی ئێسک و جمگە ⇐ أرتوپد

**ئورتۆپێدی** / urtopêdî/: ناو. ئێسکبژیشکی؛ برینکاری سەر ئێسک و جمگە ⇐ ارتوپدی

**ئورزان** / urzan/: ناو. هەڵپەڕکێ؛ هەڵبەز ⇐ رقص و پایکوبی

**ئورگ** / urg/: ناو. سازێکی گەورەی باژەن بە چەن ڕیز دوگمەی دەستی و ڕیزێک دوگمەی پایی، بۆ دەرهێنانی چەند دەنگ پێکەوە ⇐ أرگ

**ئوروپیوم** / urupyum/: ناو. توخمێکی کیمیایی کانزایی لە دەستەی لانتانیدەکان بە ژمارەی ئەتومی ٦٣ و کێشی ئەتومی ١٥١,٩٦ ⇐ اروپیم

**ئورووسی** / urûsî/: ☜ عورووسی

**ئوزون** / uzun/: ناو. گازێکی کەوەی بۆندارە لە سەرووی هەوادا پێک دێ و بەر بە ئازاری تیشکی خۆر دەگرێ ⇐ أزُن

**ئوسا**[1] / usa/: ☜ وەستا

**ئوسا**[2]: ناوەلکار. وا؛ وەها؛ بەم جۆرە (ئوسا ژ خۆ کە!) ⇐ چنین؛ این طور

**ئوسایی** / usayî/: ☜ وەستایی

**ئوستا** / usta/: ☜ وەستا

**ئوستاد** / ustad/: ☜ وەستا

**ئوستان** / ustan/: ناو. پارێزگا؛ پارێزگە ⇐ أُستان

**ئوستاندار** / ustandar/: ناو. پارێزگار ⇐ أُستاندار

**ئوسترلاب** / ustirlab/: ناو. ئوستورلاب؛ ئاسمانپێو؛ ئامرازێکی ئەستێرەناسانی پێشوو، بۆ لێکدانەوەی مەودای نێوان ئەستێرەکان ⇐ أسطُرلاب

**ئوسترە** / ust(i)re/: ناو. گوێزان؛ گیزان؛ کافرمان؛ کێرد و تیخی مووتاش ⇐ أُسترە

**ئوستورلاب** / usturlab/: ☜ ئوسترلاب

**ئوستوورە** / ustûre/: ناو. دێرۆک؛ ئەفسانەیەک لەمەڕ خودایان، بوونەوەران، کار و ڕووداوانی نائاسایی لە بارەی دیاردەگەلی سروشتی یان مێژووییەوە، لە بیر و بڕوای خەڵکی کەونارادا ⇐ أسطورە

**ئوسکوف** / uskuf/: ناو. ئەو کڵاوە چەرمینەی دە سەر و چاوی بازی دەدروون تا کەوی بێت ⇐ چشمبند باز شکاری

**ئوسمیوم** / usm(i)yum/: ناو. توخمی کیمیاوی کانزایی سەخت، بە ژمارەی ئەتومی ٧٦ و کێشی ئەتومی ١٩٠,٢ ⇐ اسمیم

**ئوشتر** / uştir/: ☜ وشتر

**ئوڤە** / uve/: دەنگەناو. بڤە؛ واوا؛ وشەی ترساندنی منداڵ لە شتێک ⇐ جیز

**ئوقرە** / uqre/: ☜ ئۆقرە

**ئوقیانوس** / uqyanûs/: ناو. محیت؛ هەریەکە لە پێنج کۆمای بەرینی ئاوی سوێر کە پێکەوە ٧٠ لە ١٠٠ی ڕووبەری گۆی زەوینیان داپۆشیوە ⇐ أقیانوس

**ئوک** / uk/: ☜ ئەوک

**ئوکسیژن** / uksîjin/: ناو. توخمی کیمیاوی بە ژمارەی ئەتومی ٨ و کێشی ئەتومی ١٥,٩٩، کە گازێکی بێڕەنگ و بۆن و تامە و قورستر لە هەوایە و ٢١٪ی بارستایی کەشە، لەگەڵ

هیدرۆژندا تێکەڵ دەبێ و ئـاو دروسـت دەبـێ اکسیژن

**ئولتیمـاتوم** / ultîmatum/: نـاو. دوا هــای؛ دوا هەڕەشـە؛ دوا وشـیاری دان و داخـوازی (زۆرتـر) وێڕای هەڕەشە و بە دیاری کردنی مـاوە بـۆ وەرام دانەوە اُلتیماتوم

**ئولکە** / ulke/: نـاو. ئۆلکـە؛ مەڵـبەند؛ ولات ‹لـە ئولکەی عیشقەدا بێ چوونە سەردار/ بە ئاسانی مەزانە بوونە سەردار «مەحوی»› حریم؛ مُلک

**ئولەمپیاد** / ulemp(i)yad/: نـاو. ١. ڕێوڕەسمـی یاریگەلی وەرزشی جەهانی کە چوار ساڵ جـارێ لـە ولاتێکـدا بـەڕێوە دەچـێ ٢. هـەرکام لـەو کێبەرکێ جیهانییانـە کـە لـە بـوارێکی زانسـتیدا بەڕێوە دەچن ١و٢. اُلمپیاد

**ئولـەمپیک** / ulempîk/: نـاو. پێوەندیـــدار بـــە ئولەمپیادەوە ‹درۆشمی ئولەمپیک› اُلمپیک

**ئولاخ** / ulax/: نـاو. ئولاغ؛ ولاغ: ١. کەر ٢. ئاژەڵی بەرزە؛ گا و گوێل و یەکسم ١. اُلاغ ٢. احشام

**ئولاخدار** / ulaxdar/: ☞ **ئولاغدار**

**ئولاغ** / ulağ/: ☞ **ئولاخ**

**ئولاغدار** / ulağdar/: ناو. ئولاخدار؛ چارەوێـدار چاروادار

**ئومک** / umik/: نـاو. پـووک؛ پووکاوڵـە؛ چەمۆڵـە؛ چەمبۆڵە ام

**ئومێ** / umê/: ☞ **ئومێد**

**ئومێد** / umêd/: نـاو. ئومێ؛ همێ؛ هومێ؛ هومێـد؛ هیوا ‹یاران هەر مەسکەن وێرانە زێد بـۆ/ ئەبلـە ئـەو کەسەن بەوش ئومێد بۆ «سەیدی»› اُمید

⊡ **ئومێد کـردن**: ئـارەزوو کـردن؛ بـە ئـاوات بـوون ‹دەمێکە چاوەڕێییەتی، گیان و دلم ویسالـی تـۆ/ ئۆمێد ئەکا کە دەرکەوێ لەپڕ مـەهی جەمالـی تـۆ «بێخود»› اُمیدوار بودن

**ئومێدەوار** / umêdewar/: ناوەڵـناو. هیوادار؛ بە هیوا امیدوار

**ئوناق** / unaq/: ناو. بوغز؛ ئراز بُغض

**ئونس** / uns/: ناو. یەکەی پێوانی کـێش بەرامبـەر بە ٢٨,٣٥ گرەم اونس

**ئونیشک** / unîşk/: ناو. نویشک؛ کەرە؛ فەریکەڕۆن؛ ڕۆنە کەرە کره

**ئووارە** / uware/: ناو. ١. ئاوبـارە؛ بەربەنـد بـۆ کـۆ کردنەوەی ئاو تاکوو زەوی بەرزی پـێ بـدێرن ٢. لێژاو؛ دژاو؛ زەوییەک کـە ئـاوی بـۆ ناچـێ ١. آب‌بند ٢. زمینی که آب بدان نرسد

**ئوێنە** / wêne/: ئاوەڵکار. ئـەویا؛ ئەینـە؛ ئـەوێ آنجا

**ئۆ**[١] / o/: ناو. ئاو؛ ئاف آب

**ئۆ**[٢]: دەنگ. ١. حەیفێ؛ مخابن ‹ئۆ بۆ ئەو ڕۆژەی لە دەسمان چووا› ٢. وشەی بانگ کردن ‹ئۆا فاتـێ› ٣. وشەی سەیرمان ‹ئـۆ چـە سـەیرە!› ١. آه ٢. آهای ٣. وه

**ئۆباف** / obav/: ناو. باوک؛ باو؛ تاتە پدر

**ئۆبـاڵ** / obał/: ناو. وەباڵ؛ گوناح؛ ئاز و بەز ‹زوبانی واعیزی بێ‌دڵ درێژە دەرحەق ئەهلی دڵ/ بە جێشـە، غـەیری ئـەو مـلپانـە، کـێ بـێ هەڵـگرێ ئۆبـاڵ؟ «مەحوی»› وبال؛ گُناه

⊡ **ئۆباڵ بە ئەستۆ بـوون**: تاوان هەڵگرتن ‹ئۆباڵی بە ئەستۆم خۆی دزیویە!› وبال به گردن گرفتن

**ئۆبژنک** / objink/: ناو. بێژنگ؛ کەو الک

**ئۆبە** / obe/: ☞ **هۆبە**

**ئۆبەرە** / obere/: ناو. پێخەف؛ لێفە لحاف

**ئۆپال** / opal/: ناو. ئاقیق؛ یاقێق عقیق

**ئۆپشکن** / opişkin/: ☞ **ئاوپژێن**

**ئـۆپێرا** / opêra/: ناو. ١. چەشنێک شانۆی لەگـەڵ مووسـیقا ‹ئـۆپێرای ریگۆلـتـۆ› ٢. بینایـەک بـۆ پیشاندانی ئەم شانۆیە ‹لە ئۆپێرادا یەکیان ناسی› ١و٢. اُپرا

**ئۆتوز** / otuz/: ناو. خلۆر؛ گلار؛ خلێر ☰ غلت

**ئۆحە** / oĥe/: دەنگەناو. وشەی گەڕاندنەوەی گا ‹فیتەی شوان، ئۆحەی گاوان/ دێ لە مۆڵگە و دەراوان «هێمن»› ☰ حرف بازداشتن گاو

**ئۆخ** / ox/: دەنگ. ۱. ئای؛ ئاخ؛ هاواری ئێشان ۲. چ خۆشە؛ وشەی دەربڕینی شادی ‹دلبەرێ ئیرۆ سەحەر ئاڤیتە جەرگێ من دو دۆخ/ یەک ل سینە، یەک ل دلدا لەو ل من تێن ئاخ و ئۆخ «مەلای جزیری»› ☰ ۱. آخ ۲. وه

**ئۆخر**[١] / oxir/: ☜ **ئۆغر**

**ئۆخر**[٢]: پێرۆ. ← **ئاخر و ئۆخر**

**ئۆخژن** / oxjin/: ناو. ئۆخە؛ ئۆقرە؛ ئارام ‹بە دیتنت ئۆخژنم هات› ☰ آرامش

**ئۆخۆیش** / oxoyş/: ☜ **ئۆخەی**

**ئۆخە** / oxe/: ☜ **ئۆخژن**

**ئۆخەی** / oxey/: دەنگ. ئایش؛ ئۆخەیچ؛ ئۆخەیش؛ ئۆخۆیش؛ ئای چ خۆشە ‹ئۆخەی وا دیسان خۆشیم دی شەوێک/ ئەویش بۆ ژیان لێم بوو بە خەوێک «هەژار»› ☰ آخش

⊡ **ئۆخەی کردن**: حەسانەوە؛ دڵنیا بوون ‹هەر کەسێ بۆی دەس بدا ساتێ لە ئامێزی گرێ/ تا لە دونیادا دەژی، دڵخۆشە، ئۆخەی کردووە «ئاوات»› ☰ آرامش یافتن

**ئۆخەیچ** / oxeyç/: ☜ **ئۆخەی**

**ئۆخەیش** / oxeyş/: ☜ **ئۆخەی**

**ئۆدا** / oda/: ناو. دایک؛ دێ؛ دالک ☰ مادر

**ئۆدە** / ode/: ناو. هۆدە؛ ژوور؛ وەتاغ؛ چاوەماڵ ☰ أتاق

**ئۆرت** / ort/: ناو. ۱. نێوان؛ ناوەڕاست ۲. ڕێز؛ وەج ☰ ۱. وسط؛ میانه ۲. ارزش؛ اعتبار

**ئۆرتە** / orte/: ناو. مافوورەی گەورە کە لە ناوەڕاستدا ڕادەخرێ ☰ فرشی که در وسط اتاق می‌اندازند

**ئۆرخە** / orxe/: ☜ **وێرغە**

**ئۆردو** / ordû/: ناو. ئۆردی: ۱. لەشکر؛ سپا ۲. تاقمێک خەڵک کە بۆ ماوەیەک لە جێگایەکدا کۆ ببنەوە و بمێننەوە ۳. لە زمانەکانی هیندووـ ئێرانی کە لە هیندووستان و پاکستان و ئەفغانستان قسەی پێ دەکەن ☰ ۱. سپاه ۲و۳. أردو

**ئۆردوبەز** / ordûbez/: ناو. جێگەی دابەزین و پشووی لەشکر ☰ جای اطراق سپاه

**ئۆردوگا** / ordûga/: ناو. هۆردووگا؛ ئووردی؛ ئەملە: ۱. شوێنی مانەوەی تاقمێک بۆ ماوەیێ ‹ئۆردووگای خوێندکاری› ۲. خانووبەرە و هۆبەی دابین‌کراو بۆ نیشتەجێ بوونی زۆرەکی یان لە ناعیلاجی کۆمەڵێک ‹ئۆردووگای پەنابەران› ☰ ۱و۲. اردوگاه

**ئۆردەک** / ordek/: ناو. مراڤ؛ مراوی ☰ مُرغابی

**ئۆردەی** / ordey/: چاوگ. هێنان؛ هاوردن؛ هانین ☰ آوردن

**ئۆردی** / ordî/: ☜ **ئۆردو**

**ئۆرغان** / orğan/: ☜ **نورغێن**

**ئۆرغێن** / orğên/: ناو. ئورغان؛ ئۆبەرە؛ لێف؛ لێفە ‹یەکێ ژ قارێ کێچی ئار بەردایە ئۆرغێن «پەند»› ☰ لحاف

**ئۆرکێستر** / orkêstir/: ناو. سازبەند؛ ڕستەی ژەنیاران ☰ أُرکستر

**ئۆرناگ** / ornag/: ناو. نموونە؛ سەمبول ☰ نمونه

**ئۆرین** / orîn/: دەنگەناو. قۆرەقۆڕی گا و ... ☰ صدای گاو و ...

**ئۆریۆن** / oryon/: ناو. ملەخرێ؛ ملەماسی ☰ أریون

**ئۆسارە** / osare/: ☜ **نەستێرە**

**ئۆغر**[١] / oğir/: ناو. ئۆخر؛ ودم؛ مبارەکی؛ پیرۆزی ☰ أُغُر

**ئۆغر**[٢]: سارستە. ئۆخر؛ پیرۆز بێ ‹ئەڕۆی ئۆغر، ئەڕۆی

ئۆغر، نەزەر ناکەی، ئەڕۆی ئۆغر/ لە تیری ئاهی ناکامیم حەزەر ناکەی، ئەڕۆی ئۆغر «گۆران»› بە خیر و خوشی

**ئۆغلمە** / oğł(i)me/: ناو. شەڕ بە تێکچرژان و پێکهەڵپڕژان؛ شەڕی قورس جنگ مغلوبه

**ئۆغەن** / oğen/: ناو. دوامین حەوتووی چلەی بچووک آخرین هفتەی چلەی کوچک

**ئۆف** / of/: دەنگ. ئاخ؛ هاواری دەرد و ئازار ‹لە حەسرەت لێوی ئالی ئەو نیگاری سوخمە شیرداخە/ دلم یا خوێنە، یاخۆ داخە، کارم ئۆفە یا ئاخە «بێخود»› أف

**ئۆف و ئاخ** / of û 'ax/: دەنگەناو. ئاخ و ئۆف؛ دەرد و دووخ؛ وەی ‹دەردەکەت ئەوسا بە نادر جار بە جارێ ئاخ و ئۆف / ئێستە دەیبیێم و دەیبینم پڕ بە شارێ ئۆف و ئاخ «حەمدی ساحیبقران»› آە و نالە

**ئۆقرە** / oqre/: ناو. ئوقرە؛ هەدا؛ ئارامی؛ ئۆخژن ‹بە شەو ژان و پەژارەم دێنە پالێ/ بە ڕۆژ ئۆقرەم نییە ساتێک لە مالێ «هێمن»› آرام

◘ **ئۆقرە گرتن**: هەدا دان؛ ئارام بوون؛ داسەکنان.
هەروەها: **ئۆقرە لێبران** آرام گرفتن

**ئۆقرەگرتوو** / oqregirtû/: ئاوەلناو. ئارامبوو؛ داسەکناو آرام گرفته

**ئۆکالیپتوس** / okalîptûs/: ناو. دارێکە لە بیچمی دارە بی، کە لە ئوسترالیاوە هاتووە و گەلاکەی بۆ دەرمان ئەشێ اکالیپتوس

**ئۆگر** / ogir/: ئاوەلناو. هۆگر: ١. خوویێ گرتوو ٢. دەستەمۆ؛ دەسەمۆ؛ تۆتکە ٣. لاگر؛ لایەنگر؛ داژدار ١. مأنوس ٢. رام ٣. طرفدار

**ئۆگری** / og(i)rî/: ناو. پابەندی؛ گیرۆدەیی؛ وەلفەت علاقەمندی

**ئۆگە** / oge/: جێناو. ئەوێ؛ وێدەرێ آنجا

**ئۆل** / ol/: ناو. دین؛ ئایین؛ مەزەب ‹ئۆلا مە ئێزدییە› دین

**ئۆلک** / olik/: ناو. ١. ئاریخ؛ مێخ زنجیر ٢. چەپەر؛ تامان؛ تەیمان؛ درگا و دیواری لە شووڵ دروستکراو ١. میخ طویلە ٢. پرچین و دیوار ترکەای

**ئۆلکە** / olke/: ناو. مەڵبەند؛ مەیدان ‹لە ئۆلکەی جوانییا گەر لافی شاهی لێ بدەی، لێت دێت «بێکەس»› منطقه

**ئۆلی** / olî/: ☜ حۆلی ـ٢

**ئۆلگ** / olig/: ☜ ئالف ـ١

**ئۆمای** / omay/: چاوگ. هاتن آمدن

**ئۆمەت** / omet/: ناو. دەستەی پەیڕەوانی دینێکی تایبەت أمت

**ئۆمی**[١] / omî/: ناو. ئەوانەی کە سەید نین غیر سادات

**ئۆمی**[٢]: ئاوەلناو. نەخوێندەوار؛ بێسیوات درس ناخوانده

**ئۆناق** / onaq/: ناو. گرێ؛ بوغمە عُقده

**ئۆوەی** / owey/: دەنگ. ١. دەنگێک بۆ شەرم کردن ‹ئۆوەی کچەکێ! پیاو دیتیانم!› ٢. بۆ دەربڕینی خەم ‹ئۆوەی حەیف و خەسارێ› ١. خاک عالم ٢. آخ

**ئۆه**[١] / oh/: ناو. ئووە؛ شەونم؛ ئاونگ شبنم

**ئۆه**[٢]: دەنگ. دەنگی دەربڕینی وەڕەزی ‹ئۆه لەم بۆیە!› آە؛ حرف تنفر

**ئۆی** / oy/: دەنگ. ١. وەی؛ هاواری دەرد ‹ئۆی مردم! ئەم ژانە کوشتمی!› ٢. وشەی دەنگ دان ‹ئۆی هەتیو! هەر دەتکووژم› ١. وای ٢. های؛ حرف ندا

**ئۆیمە** / oyme/: ناو. جۆرێ کراسی ژنانە نوعی پیراهن زنانه

**ئۆین** / oyin/: ناو. فێڵ و مەکر ‹بە ڕۆژ هەول ئەدەن بەو حالە پیسە/ بە سەد ئۆین و سوێند و دەسیسە «پیرەمێرد»› فریب

**ئۆین‌باز** / oyinbaz/: ئاوەڵناو. ۱. ئۆینچی؛ فێڵباز؛ ساختەچی ۲. گاڵتەچی؛ قسەخۆش ■ ۱. مکّار ۲. شوخ‌طبع

**ئۆینچی** / oyinçî/: ☜ **ئۆین‌باز ـ۱**

**ئۆیە** / oye/: ناو. ۱. ئۆییە؛ پوولەکە؛ پوولەکە؛ بریقە؛ ئەو وردیلە تەنکانەی لە کەناری دەسماڵی سەری دەدروون بۆ خشڵ ۲. تیسماڵکی پارچەی کون ـکونی ناسک کە لە کەناری کەوای دەدروون و بریقەی وێ دەخەن ■ ۱. پولک زینتی ۲. نواری که پولک بر آن دوزند

**ئۆییە** / oyye/: ☜ **ئۆیە ـ۱**

**ئو** / û/: دەنگ. هاوار لە دەرد ■ آخ

**ئوردی** / ûrdî/: ☜ **ئۆردوگا**

**ئورکوتک** / ûrkutik/: ☜ **ئورکوتك**

**ئورکوتک** / ûrkûtik/: ناو. ئوورکوتک؛ کۆترەگایە؛ کۆترەباڵ‌بازوو ■ کبوتر جنگلی

**ئورین** / ûrîn/: چاوگ. لووراندن ■ زوزه کشیدن

**ئوزیان** / ûzyan/: چاوگ. ئاوا بوون؛ نیشتن ■ غروب کردن

**ئوسا** / ûsa/: ☜ **وەستا**

**ئوسار** / ûsar/: ☜ **هەوسار**

**ئوفە** / ûfe/: ناو. نەخۆشییەکی یەکسمە وەک هەلامەت ئاو بە لووتیدا دێت ■ از بیماری‌های دام

**ئوک** / ûk/: ناو. ئەوک؛ گەروو؛ قرگ؛ قورگ؛ قوڕی ■ گلو

**ئون** / ûn/: ناو. بیانوو؛ پەلپ؛ بیانک ■ بهانه

**ئونە** / ûne/: جێناو. هۆ ئەوە؛ ئا ئەوە ‹ئوونەیە کێشدێ› ■ آن

**ئووە** / ûwe/: ☜ **ئۆهـ**[1]

**ئویف** / ûyf/: دەنگ. بەهـ بەهـ؛ پەک ■ بەبە

**ئە ـ** / e-/: پێشگر. ۱. دەـ؛ نیشانەی کار بە بەردەوامی ‹ئەبەم؛ ئەخوا؛ ئەچووین› ۲. بۆ پێداگری دێتە سەر جێناوەکانی یەک و دووەم کەسی تاک ‹ئەمن؛ ئەتۆ› ■ ۱. نشانه‌ی استمرار فعل ۲. نشانه‌ی تاکید

**ئەئاوا** / e'awa/: ☜ **ئاوا**[1]**ـ۳**

**ئەئێستا** / e'êsta/: ☜ **ئائێستا**

**ئەبابۆز** / ebaboz/: ناو. دز؛ ماڵبڕ ■ دُزد

**ئەبتەر** / ebter/: ئاوەڵناو. گەلحۆ؛ دەبەنگ؛ شێتۆکە ■ خُل

**ئەبجەد** / ebced/: ناو. ۱. ناوی جۆرێ ئەلفوبێتکەی کۆنی عەرەبییە کە بە «ئەبجەد» دەست پێدەکا و هەر پیتێک ژمارەیەکی هەیە و حیساباتی پێدەکرێ ۲. ☜ **حیساب ئەبجەد** ■ ۱. ابجد ۲. ☜ **حیساب ئەبجەد**

**ئەبدال** / ebdal/: ناو. *[ڕێزمان]* دوو یان چەند وشە کە لە یەک ڕیشەن و لە ڕاستیدا هەر یەکن (وەک: ئەبلەق، هەبلەق، ئەولەق) ■ ابدال

**ئەبداڵ** / ebdał/: ناو. ۱. نێرەی پۆڕ کە مەلێکی کێوییە ۲. ئەوداڵ؛ عەوداڵ؛ گەڕیدەی بێ‌ماڵ ■ ۱. دُرّاج نر ۲. خانه‌بدوش

**ئەبرۆ** / ebro/: ناو. برۆ؛ برهـ؛ خەتە مووی بەر توێڵ و بان چاو ‹ئەبرۆ چ کەوانی بێ‌گرێ و ڕێک؟/ پەیکانی بژانگ چ تیری دڵپێک! *«هەژار، مەم و زین»*› ■ ابرو

**ئەبرەش** / ebreş/: ئاوەڵناو. عەبرەش: ۱. ئەبڕەش؛ تازەزاوی بێ‌شیر یان کەم‌شیر کە بێچووەکەی تێر ناکا (مەڕ یان بزن) ۲. هەبرەش؛ تینوو؛ تینگ ■ ۱. تازه زاییده‌ی کم‌شیر (دام) ۲. تشنه

**ئەبڕەش**[1] / ebřeş/: ناو. ئەسپی شین‌بۆری گوڵ‌ـگوڵ ■ ابرش

**ئەبڕەش**[2]: ☜ **ئەبرەش ـ۱**

**ئەبلە** / eble/: ئاوەڵناو. گەوج؛ نەفام؛ تێنەگەیشتوو ■ ابله

**ئەبلەخەرج** / eblexerc/: ئاوەڵناو. هەڵەخەرج؛ قەللاش ■ ولخرج

**ئەبڵەق** / ebłeq/: ئاوەڵناو. ١. ئەوڵەق؛ هەبڵەق؛ ڕەش و سپی؛ سوور و سپی؛ بازگ؛ بازوو؛ بازە؛ بەوز؛ بۆز؛ جنجربەڵەک؛ ماچیل؛ ڕەشباز؛ چیل؛ لەکڕ؛ دوو ڕەنگ، بەتایبەت ڕەش و سپی ٢. زاق؛ مۆڵەق ‹کە زینیان کرد لە پشتی ماینە ڕەشکوێت/ گەڕا چاوم لەوێدا زەرد و ئەبڵەق «شێخ ڕەزا»› ١. ابلق؛ خلنگ ٢. خیره

**ئەبوا** / ebwa/: ئاوەڵکار. ئەشیا؛ ئەشیایێ؛ دەبا ‹دوێکە ئەبوا بهاتایی› بایستی

**ئەبەد**[1] / ebed/: ناو. ١. کۆتایی جیهان؛ ئاکامی دنیا ٢. *[مەجاز]* بێ بڕانەوە؛ هەتا ـ هەتا؛ تاهەتا ١و٢. ابد

**ئەبەد**[2]: ئاوەڵناو. هەتایی؛ هەمیشەیی ‹حەپسی ئەبەد› ابد

**ئەبەد**[3]: ئاوەڵکار. هەرگیز؛ ئەبەدەن ‹گەلێ پێم خۆشە ئەم شەرتە، لە دڵ خۆما کە وا کردم/ ڕەفیقی بەد ئەبەد ناکەم، لە خاکیشا کە من مردم «قانع»› ابداً

**ئەبەدەن** / ebeden/: ☜ ئەبەد[3]

**ئەبەدی** / ebedî/: ئاوەڵناو. هەرهە؛ نەمر؛ لە نەمان بەدوور ابدی

**ئەبەر** / eber/: ئامراز. ڕوو لە؛ لە ڕووی ‹عەهد و وەفا نەماوە کە جەور و جەفایە باو/ لەم عەسر و ئەهلە شەکوە ئەبەر تۆیە یا موغیس! «مەحوی»› به سوی

**ئەبەنووس** / ebenûs/: ☜ ئابنووس

**ئەبیاڵ** / ebyał/: ناو. ئەدیال؛ پەتوو؛ بەتانی پتو

**ئەبێ** / ebê/: ئاوەڵکار. دەبێ؛ ئەشێ ‹ئەبێ زوو بڕۆم› باید؛ بایستی

**ئەپرەخ** / eprex/: ناو. یاپراخ؛ دۆڵمەی گەلامێو دُلمه

**ئەتراف** / etraf/: ناو. دەوروبەر؛ ئەم لا و ئەو لا؛ قەراخ و بیجاخ پیرامون

**ئەترەش** / etreş/: ناو. ١. ورە؛ زەندەق؛ زەنەق؛ هێزی دڵ؛ زات ٢. فریشتەی ئاگاداری ئاو لە ئایینی زەردەشتدا ١. زَهره ٢. فرشتەی نگهبان آب

⊡ **ئەترەش چوون**: ئەترەش پەقین؛ زاڵەترەک بوون زهرەترک شدن

**ئەترەش پەقین**: ☜ **ئەترەش چوون**

**ئەتشە** / etşe/: ناو. جۆرێک نەخۆشی مەڕ از بیماری‌های گوسفند

**ئەتک** / etk/: ناو. سووکایەتی؛ کارەساتی لەناو بردن؛ زیان گەیاندن هتک

⊡ **ئەتک کردن**: سووکایەتی بە سەر هێنان؛ ئابڕوو بردن هتک کردن

**ئەتک لێ بردن**: ئابڕوو بردن آبرو بردن

**ئەتڵەس** / etłes/: ناو. ١. جۆرێ قوماشی هەوریشمی ٢. کۆمەڵە وێنە، نەخشە و زانیاری سەر بە بابەتێکی دیاریکراو ‹ئەتڵەسی جوگرافیایی› ١و٢. اتلس

**ئەتڵەسی**[1] / etłesî/: ناو. ١. گۆچانقەند؛ جۆرێ ئاونەوات ٢. گوڵەحەریرە؛ گوڵبۆری؛ گوڵی ئەتڵەسی؛ گوڵێکی یەکساڵەیە بۆ جوانکاری بەکاری دێنن. گەڵاکانی پانە و گوڵە بۆنخۆشەکانی بە چەندین ڕەنگی جوان دەبینرێن ١و٢. اتلسی

**ئەتڵەسی**[2]: ئاوەڵناو. بە ڕەنگی گوڵی ئەتڵەس اتلسی

**ئەتمۆسفێر** / etmosfêr/: ناو. ١. کەش؛ هەوا؛ تەوشک؛ بڵندایی لە زەوی بەرزتر ٢. یەکەی تەوژم، بەرامبەری ٦٦٧ گرەم لە سەر سانتیمەتری چوارگۆشە ١و٢. اتمُسفر

**ئەتوار** / etwar/: ناو. ڕەوش و کردەوە ‹مەشرەبی نالی گەلێ، ئابی و ترشە بەلێ/ موعتەریفە خۆی دەلێ: چا نییە ئەتواری من «نالی»› رفتار؛ منش

⊡ **ئەتوار ڕشتن**: ئەتوار نواندن؛ کەشم و نەشم نواندن؛ بە خۆ و خدەی تایبەتی سەرنج

ڕاکێشان ☰ عشوەگری کردن

**ئەتوار نواندن:** ☜ **ئەتوار ڕشتن**

**ئەتوارخراپ** / etwarx(i)rap/: ئاوەڵناو. تـزۆک؛ گەنەکار؛ ئاکارخراپ ☰ بدکاره

**ئەتوارلەق** / etwarleq/: ئاوەڵناو. تەورلەق؛ ئاکارناحەز؛ بەدڕەوش ☰ بدرفتار

**ئەتواری** / etwarî/: ئاوەڵناو. بەدتەور؛ خاوەن ئاکاری نائاسایی و نەگونجاو ☰ اطواری

**ئەتوان**[1] / etwan/: چاوگ. خوازتن؛ ویستن ☰ خواستن

**ئەتوان**[2]: ☜ **هەتوان**

**ئەتوم** / etum/: ناو. بچووکترین پاژی هەر شتێ کە لە ڕەوتی شیمیاییدا ناگۆڕێ و شی نابێتەوە ☰ اُتم

**ئەتۆ** / eto/: جێناو. تۆ؛ تە؛ ئەتوو؛ توو ‹ئەتۆ ئەی چرچە پیسەی لینگ گواوی!/ لەگەڵ زەڕڕاتی عالەم تێکەلاوی؟ «جەنابی مەلا»› ☰ تو

**ئەتو** / etû/: ☜ **ئەتۆ**

**ئەتوز** / etûz/: ☜ **نوتوز**

**ئەتەر** / eter/: ناو. ۱. شوێ؛ شوێن؛ نیشان ۲. ☜ **هەتەر**[1] ☰ ۱. اثر ۲. ☜ **هەتەر**[1]

**ئەتەک** / etek/: ناو. ئاتەگ؛ ئەتەگ؛ شاقەڵ؛ داوێنی شۆڕ ☰ دامن بلند

**ئەتەگ** / eteg/: ☜ **ئەتەك**

**ئەتەم** / etem/: ناو. گەرای وە گیان هاتوو ☰ جنین تازه جان گرفته

**ئەجاو** / ecaw/: ناو. شەرم؛ حەیا؛ فەدی ‹هەی بانووی بێعەیب! لە پەردەی ئەجاو! «فولکلۆر»› ☰ شرم؛ حیا

⊡ **ئەجاو کردن:** شەرم کردن؛ حەیا کردن ‹لە خوا ئەجاو کە و ناکەسی مەکە! «پەند»› ☰ شرم کردن

**ئەجداد** / acdad/: ناو. باپیران؛ ئاژدا؛ ئاژداد ☰ اجداد

**ئەجر** / ecr/: ناو. سزای باش؛ پاداش ‹تۆ لوای بەو ئەجر سەختی زامەوە/ من پەرێ حەسرەت دووریت مامەوە «مەولەوی»› ☰ اجر

**ئەجزا**[1] / ecza/: ناو. دەوا؛ دەرمان ☰ دارو

**ئەجزا**[2]: ئاوەڵناو. ۱. دەسکرد؛ چێکراو؛ ناسروشتی ۲. لە نەوت یان بنێشت دروستکراو ‹تەزبێحەکەت ئەجزایە، شەمچەی پێوەنی بۆچرووکی دێ› ☰ ۱. مصنوعی ۲. پلاستیکی

**ئەجزاچی** / eczaçî/: ناو. دەواخانەچی؛ دەرمانفرۆش ☰ داروفروش

**ئەجزاخانە** / eczaxane/: ناو. دەرمانخانە؛ دەواخانە؛ دووکانی دەرمان فرۆشتن ☰ داروخانه

**ئەجکاندن** / eckandin/: چاوگ. لە نێو بردن؛ نەهێشتن؛ نەبوو کردن؛ قڕ تێخستن ☰ از بین بردن

**ئەجکین** / eckîn/: چاوگ. لە نێو بران؛ نەمان؛ نەبوو کران ☰ نابود شدن

**ئەجندا** / ecinda/: ناو. پرۆژە؛ گەلالەی کارێکی گرینگ و بەبەهرە ☰ پروژه

**ئەجندە** / ecinde/: ناو. *[باوەری کۆن]* جندۆکە؛ ئەجنە ☰ جن

**ئەجنە** / ec(i)ne/: ☜ **ئەجندە**

**ئەجنەبی**[1] / ecnebî/: ناو. غەوارە؛ دەرەکی ‹میللەتی بێ علیم و سەنعەت باوەڕت بێ دائیما/ وا لە ژێر پێی ئەجنەبیدا ناوی هەر بێقیمەتە «بێکەس»› ☰ خارجی؛ بیگانه

**ئەجنەبی**[2]: ئاوەڵناو. لاوەکی؛ سەر بە بێگانە ‹تۆ کە چاوت پێم بلێ دەرسی زوبانی ئەجنەبی/ وەک «موفەتیش بەگ» ئیتر من تەرجومانم بۆ چییە؟ «بێخود»› ☰ بیگانه؛ خارجی

**ئەجەل** / ecel/: ناو. ئەنجەل؛ ئەنجەڵ؛ هەجەل؛ هەنجەل؛ ئەجەڵ: ۱. ماوە؛ مەودا ۲. ئاکام؛ ئەنجەڵ؛ وادەی مەرگ ‹بەجێ ماوم لە یاران، نابەجێ ماوم، ئەجەل زوو بە!/ بە مردن لەم قوسووری

ژینە ئیستیعفا نەکەم، چ بکەم؟ «مەحوی»› ﷼ ١. مدت ٢. اجل

▣ **ئەجەل هاتن**: وەختی مەرگ هاتن ‹هەر بینا هات ئەجەل و من مردم/ با لە شیوێ پەڕ و باڵی بردم «سوارە»› ﷼ اجل رسیدن

**ئەجەڵ** / ecel/: ☜ **ئەجەل**

**ئەجیای** / ecyay/: چاوگ. وا زانین ﷼ انگاشتن

**ئەجێ** / ecê/: ئاوەڵکار. ئەیژی؛ وەک ئەوەیە ‹مەمەڵجێش نارە، کوڵمێش سوورە ساوە/ وێش ئەجێ سەڵوێنە مدرێنە پاوە «سەیدی»› ﷼ گویی

**ئەح** / eĥ/: دەنگ. ئەهـ؛ وشەی بێزاری و گوێ پێ نەدان ‹ئەح! دەی سا چی لێ بکەم؟› ﷼ آه

**ئەح ـ ئەح** / eĥ eĥ/: دەنگ. وشەی دەرکردنی پەز لە ئاغەڵ ﷼ حرف راندن گله از آغَل

▣ **ئەح ـ ئەح کردن**: لێخوڕین؛ دەرکردنی مەڕ و ماڵات لە ئاغەڵ ﷼ راندن گله

**ئەحا** / eĥa/: دەنگ. تەحا؛ پەحا: ١. وشەی سەیرمان ٢. وشەی باوەڕ نەکردن ﷼ ١. وه ٢. وا

**ئەحمەدڕاوکەر** / eĥmedřawker/: ناو. باڵدارێکی لاقدرێژی پێ بەپەردەیە لە قەراغ ئاوان دەژی ﷼ گیلانشاه بزرگ

**ئەحمەق** / eĥmeq/: ئاوەڵناو. هەقمەق؛ گەوج؛ گەللایی و نەفام ‹وەکوو یەک دێتە بەرگوێی پیاوی ئەحمەق/ سەفیری بولبول و ئاوازی لەقلەق «شێخ ڕەزا»› ﷼ احمق

**ئەحواڵ** / eĥwał/: ناو. هەواڵ؛ حاڵ و هەواڵ؛ چۆنیەتی باری ژیان ‹ئەحواڵی ئەم زەمانە لە کایەی مناڵ ئەچێ/ دنیایەکی چ پووچە لە زەرفی بەتاڵ ئەچێ «حەمدی ساحیبقران»› ﷼ احوال

**ئەحواڵپرسی** / eĥwałpirsî/: ناو. چاک و چۆنی؛ کار و ڕەوتی بە سەر کردنەوە ﷼ احوالپرسی

**ئەحیا** / eĥya/: ناو. ١. شەونخوونی؛ شەوبێداری پتر لەگەڵ نوێژ و نزادا ٢. ڕەوتی بووژانەوە؛ سەرهەڵدانەوە ﷼ ١و٢. احیا

**ئەخبار** / exbar/: ناو. هەواڵ؛ دەنگوباس؛ نووچە ﷼ اخبار

**ئەخت** / ext/: لێل. ← **ئەختوچار**

**ئەختان** / extan/: ناو. دەرفەت؛ فرسەت ﷼ فُرصت

**ئەخترمە** / extirme/: ناو. ئەسپی لە دوژمن گیراو ﷼ اسب غنیمتی

**ئەختوبار** / extubar/: ئاوەڵناو. بەئەمەگ؛ پێزان؛ وەفادار ﷼ وفادار

**ئەختوچار** / ext û çar/: ناو. کۆشش و تەقالا؛ حەولی زۆر ‹هەرچەند ئەختوچارم کرد پێم نەکرا› ﷼ تلاش بسیار

**ئەختە**[١] / exte/: ناو. داری شینی سەرقرتاو ﷼ درخت سبز هرس شده

**ئەختە**[٢]: ئاوەڵناو. ئێختە؛ یەختە؛ گوندەرهاتوو ﷼ اخته

▣ **ئەختە کردن**: خەساندن؛ گون دەرهێنان ﷼ اخته کردن

**ئەختەر** / exter/: ناو. ئەستێرە؛ هەسارە ﷼ ستاره

**ئەختەرمە** / exterme/: ناو. چۆلەچرا؛ چاوڵ ﷼ مشعل هیزمی

**ئەخش** / exş/: ناو. تەشق؛ عەرش؛ بەرزایی ئاسمان ﷼ عرش

**ئەخشاڵ** / exşał/: ناو. ئەشغاڵ؛ وردە و پردەی ناوماڵ ﷼ خرت‌وپرت

**ئەخلاق** / exlaq/: ناو. خوو؛ خدە؛ ڕەوشت ﷼ اخلاق

**ئەخلەخ** / exlex/: ناو. سوخمە؛ جلی ژێر کەوا ﷼ نیمتنەی زیر قبا

**ئەخم** / exm/: ناو. ڕووترشی؛ کاری ڕوو گرژ کردن ﷼ اخم

**ئەخموتەخم** / exm û texm/: ناو. کار و ڕەوتی ناوچاو تاڵ کردن و وەڕەزی نواندن ‹بەسییە ئەخموتەخم ناوچاوت بکەوە!› ﷼ اخم‌وتَخم

**ئەخەکن** / exekin/: ناو. شوێن؛ جێ؛ جێگا ☰ مکان

**ئەخیە** / exye/: ناو. مێخ‌تەوێڵە؛ گولمێخی بەستنەوەی هەوساری ئەسپ و حەیوانی بەرزە ☰ میخ طویله

**ئەدا** / eda/: ناو. ١. دایک؛ داڵک ٢. ڕەوش و ئاکار ‹ئەی شەککەرین دەهانی شەکەر نوتقی لێو نەبات/ شیرین هەموو شەمایل و شیرین هەموو ئەدات «ئەدەب»› ٣. قەرەبوو؛ کاری دانەوە ‹هەرچەند وەکوو خەنجەری ئەڵماسە زمانم/ نابڕێ سەری موویێ لە ئەدای شوکری نیعەمتان «شێخ ڕەزا»› ٤. لاسایی؛ دەمەلاسکە ‹چ ڕات دەکەوێ ئەدام دەردێنی؟› ٥. ناز و نووز؛ عیشوە و کرشمە ‹دڵێکی غەمزەدەم بڕ مەحرەمی ڕاز/ ئەویشت لێم بە سەد شێوە و ئەدا سەند «ئەدەب»› ٦. کاری دەربڕین؛ لێدوان ‹ئەدای پەشێوی حاڵەت جەستەم/ دوورەن جە تەحریر خامەی شکەستەم «مەولەوی»› ☰ ١. مادر ٢. اخلاق ٣. ادا ۴. شکلک ۵. ناز و کرشمه ۶ بیان

⊡ **ئەدا دەرهێنان:** لاسایی کردنەوە؛ دەمەلاسکێ کردن ☰ شکلک درآوردن

**ئەدا کردن:** بەجێ هێنان؛ جێبەجێ کردن ‹نالی عەجەب بە قووەتی حیکمەت ئەدا دەکا/ مەعنایی زۆر و گەورە بە لەفزی کەم و بچووک «نالی»› ☰ ادا کردن

**ئەدابابا** / edababa/: ناو. گوڵێکی سوورە وەک پەنجە دەچێ ☰ از گُل‌ها

**ئەداڵەکەرەسێ** / edałekeresê/: ناو. ڕازیانە کێویلە ☰ رازیانه کوهی

**ئەدامەردە** / edamerde/: ناو‌ئاو. دایک‌مردوو ☰ مادرمُرده

**ئەداوئەتوار** / eda w 'etwar/: ناو. ١. ئایین و ئۆین؛ کردەوەی شانۆگەریانە بۆ شۆخی و پێکەنین ٢. ڕەوشتی ناپەسند و ناشیرین ☰ ١و٢. ادا و اطوار

**ئەددی** / eddî/: دەنگ. وشەیەکە بۆ پووچاندنەوەی وتەی وێژەر بە گاڵتەوە ☰ حرف انکار و تحقیر سخن

**ئەدگار** / edgar/: ☜ **ئادگار ـ١**

**ئەدوا** / edwa/: ناو. ١. بەهارات؛ ئالات؛ دا و دەرمانی چێشت خۆشکەر ٢. وتار و باس ☰ ١. ادویه ٢. گفتار

**ئەدەب** / edeb/: ناو. ١. وێژە؛ ئەدەبیات ٢. شەرم؛ حەیا ‹نزوول کێشا دەست بەختم ئەو ڕای بەد/ پای ئەدەب نە ڕای عەدەم کەردم ڕەد «مەولەوی»› ٣. تەمێ ‹با بچینەوە ماڵ بزانە چۆن ئەدەبت دەکەم!› ٤. *[مەجاز]* ناوگەڵ ‹ئەدەبت داپۆشە!› ☰ ١. ادبیات ٢. ادب؛ احترام ٣. تنبیه ۴. عورت

⊡ **ئەدەبی بەراوردی:** کۆمەڵە دەق و زانستگەلی پێوەندیدار بە بەراوەرد کردنی ئەدەبیاتی دوو گەل و وڵات و زمان ☰ ادبیات تطبیقی

**ئەدەبی بەرخودان:** ئەدەبیاتێ کە ناوەرۆکی سەر هەڵدان و بەرخوەدانی گەل و کۆمەڵێک لە بەرامبەر ناڕاستی و زڵم و زۆرەوە دەردەخات ☰ ادبیات پایداری

**ئەدەبی کۆن:** ئەدەبیاتی پێداگر لە سەر بنەماکانی چینی پێشوو ☰ ادبیات کلاسیک

**ئەدەبی نوێ:** ئەدەبیاتی پێداگر لە سەر گۆڕان و وەرگرتنی دابی نوێ ☰ ادبیات جدید

**ئەدەبی سەردەم:** ئەدەبیاتی دوادەورە لە هەر کاتێکدا ☰ ادبیات معاصر

**ئەدەبخانە** / edebxane/: ناو. *[مەجاز]* ئاودەست؛ دەساو ☰ مُستراح

**ئەدەبسز** / edebsiz/: ناو‌ئاو. بێ‌ئەدەب؛ بێ‌ڕەوشت ☰ بی‌ادب

**ئەدەبی** / edebî/: ناو‌ئاو. وێژەیی؛ چۆنیەتی وتە یان نووسراوەیەک کە پێوەندی بە وێژەوە هەبێ

🇮🇷 ادبی

**ئەدەبیات / edebyat/**: ناو. وێژە؛ بێژە؛ تۆرە؛ کۆمای رامان و رانانی هونەری گەل و کۆمەڵێک لە چوارچێوەی وتاردا 🇮🇷 ادبیات

**ئەدی / edî/**: ئاوەڵکار. ١. ئیدی؛ چیتر (بە دوای رووداوی بەرباسدا) ‹ئەو کارەت کرد، ئەدی مەیکە!› ٢. ئەریێ؛ بەڵێ؛ ئەی چۆن (وەک وەرام) ‹ـ شەو نانت خوارد؟ ـ ئەدی› ٣. ئیدی؛ ئێستا؛ کە وا بوو (وەک پرسیار) ‹ئەگەر ئاشت بوونەوە، ئەدی بۆ ناچییەوە؟› ٤. جگە لەوە؛ هەمتر ‹ئەدی، چی گوت؟› ٥. مەگەر؛ ئایا ‹ئەدی نەمگوت وا مەکە؟›
🇮🇷 ١. دیگر ٢. چرا که نه ٣و٤. دیگر ٥. مگر

**ئەدیاڵ / edyal/**: ☜ ئەبیاڵ

**ئەدیب / edîb/**: ناو. ١. وێژەوان؛ تۆرەوان؛ تۆرەڤان؛ تۆرەمەند؛ وێژەناس؛ ئەدیب ٢. نووسەر یان شاعیر
🇮🇷 ١و٢. ادیب

**ئەر / er/**: ئامراز. ئەگەر ‹با شەو بڕوا سەحەر بێ، باغی گوڵان وەبەر بێ/ ئەر تۆ مەیلت لەسەر بێ کافر ئیسلامی ناوە «وەفایی»› 🇮🇷 اگر

**ئەراگێڵ / eragêl/**: ئاوەڵناو. هەڵوەدا؛ پەرەوازە؛ پەرتەوازە؛ دوور لە ماڵ و زێدی خۆ ‹خسووس من سەرعی و لێوە و وێڵ تۆم/ سەودایی خەمبار ئەراگێڵ تۆم «مەولەوی»› 🇮🇷 آواره

**ئەرامەندە / eramende/**: ئاوەڵناو. ئەرامەنە؛ پەرێشان و داماو ‹جە واتەی شێرۆ سەرەفکەندە بین/ جە سەودای گەردوون ئەرامەندە بین «خانای قوبادی»› 🇮🇷 پریشان؛ وامانده

**ئەرامەنە / eramene/**: ☜ ئەرامەندە

**ئەرباب[1] / erbab/**: ناو. خاوەن ‹لە بەر قاپی سەرا سەفیان دەبەست شێخ و مەلا و زاهید/ مەتافی کەعبە بۆ ئەربابی حاجەت، گردی سەیوان بوو «شێخ رەزا»› 🇮🇷 ارباب

**ئەرباب[2]**: ئاوەڵناو. رووخۆش؛ سەوداخۆش و دلاوا ‹کوڕێکی زۆر ئەربابە، بیناسی خۆشت دەوێ› 🇮🇷 خوش‌اخلاق

**ئەربابانە[1] / erbabane/**: ناو. بەهرەی ماڵکانە 🇮🇷 بهره‌ی مالکانه

**ئەربابانە[2]**: ئاوەڵناو. ئاغایانە؛ وەکوو ئەرباب ‹جلوبەرگی ئەربابانە› 🇮🇷 اربابانه

**ئەربابانە[3]**: ئاوەڵکار. ئاغایانە؛ بە شێوە و داب و دەستووری ئەربابان ‹ئەربابانە لێ دەخوڕێ!› 🇮🇷 اربابانه

**ئەربووش / erbûş/**: ناو. ئەسپی شێی سوورهۆڵ 🇮🇷 اسب کرنگ

**ئەرتەش / erteş/**: ناو. قوشوون؛ سپا: ١. سەرجەمی هێزی چەکداری وڵاتێک ٢. یەکەیێکی چەکداری ٣. کۆمەڵەیەکی گەورە لە چەکدارانی راهاتوو بۆ شەڕ، بەتایبەت لە وشکانیدا
🇮🇷 ١تا٣. ارتش

**ئەرتەشی[1] / erteşî/**: ناو. سپایی؛ قۆشەنی؛ نیزامی؛ کەسێ کە لە ئەرتەشدا کار دەکا 🇮🇷 ارتشی

**ئەرتەشی[2]**: ئاوەڵناو. سەر بە ئەرتەش ‹جلوبەرگی ئەرتەشی› 🇮🇷 ارتشی

**ئەرتیچۆک / ertîçok/**: ناو. کەنگەر؛ کنگر 🇮🇷 کنگر

**ئەرجن / ercin/**: ناو. بادامی کێوی 🇮🇷 بادام کوهی

**ئەرجوو / ercû/**: ناو. تکا؛ کاری پاڕانەوە 🇮🇷 رجا؛ خواهش

▣ **ئەرجوو بوون**: چاوەڕوان بوون؛ تەمادار بوون 🇮🇷 چشم داشتن

**ئەرجوو کردن**: تکا کردن؛ لاڵانەوە ‹ئەوەند ئەرجوو دەکا نالی کە جار ـ جار/ بکەن یادی موحیببی بێ ریاتان «نالی»› 🇮🇷 خواهش کردن

**ئەرجووزە / ercûze/**: ناو. ڕەجەز؛ گۆشەیەک لە دەزگای چوارگا لە مووسیقای ئێرانی 🇮🇷 رَجَز

**ئەرخ / erx/**: ناو. چاڵ؛ قووڵکە 🇮🇷 چاه

**ئەرخاندن / erxandin/**: چاوگ. ماندوو/ شەکەت

کردن ☰ خسته کردن

**ئەرخوت** / erxut/: ناو. ئەرخۆت؛ هەرخۆت؛ لۆلەپـە مەشکە؛ دوو داری گرۆڤەری خـەڕاتی کـراوی دە دۆژەنگ خراو ☰ دستگیرەی مشک

**ئەرخۆت** / erxot/: ☜ **ئەرخوت**

**ئەرخـە** / erxe/: نـاو/ ئاوەڵـناو. یاریـدەر؛ کۆمـەگ؛ پشتیوان ☰ پُشتیبان

**ئەرخەوان** / erxewan/: ناو. ئەرغەوان؛ ئەرغوو: ۱. دارئـەرغوو؛ نـاوی دارێکـی جوانـە و لـە پـارک و جادەدا بۆ جوانکـاری دەبێـت، سـەرەتای بـەهار گوڵـی ئامـاڵ سـوور و بەنەوشـی هەیـە و پـاش گوڵەکانی گەڵای ساف و بیچمـی دڵ دەردێـت. لاسـکەکانی بـۆ چنـینی سـەبەد و نانەشـان و سـوۆقاتی بـە کـار دێـنن ۲. گوڵـەئەرغوو؛ گوڵەئەرخوو؛ گوڵە ئەرخەوانکـە؛ گۆڵـەئەرخەوانە؛ زڕەشەوبۆ؛ پووشەکەوە؛ ناوی گوڵێکە لـە بنـەمای شـەوبۆ و خەرتەڵـە، بـە ڕەنگـی سـپی ئـاڵ و کەمڕەنگ، لە سەر پەڕەکانی ڕەگ ڕەگ دیـارە و بۆنخۆشە ☰ ۱و۲. ارغوان

**ئەرخەوانسـوور** / erxewansûr/: نـاو/کینایـە/ ۱. هەوەڵـی بـەهار ۲. سـێلاوی بـەهاران کـە هەڵدەسـتێ و لـێل و مەیلـەو سـوورە ‹ئەرخـەوانسـووری بـەهارە جەغـەتووی فرمێسـکم/ ئـەوی سـامانی مـە بـوو بـردی هـەمووی فرمێسـکم «بۆران»› ☰ ۱. اول بهار ۲. سیلاب گل‌آلود بهاری

**ئەرخەوانی**[1] / erxewanî/: ناو. ئەرغـەوانی؛ ڕەنگـی سووری بریقەداری ئاماڵ بەنەوش ☰ ارغوانی

**ئەرخـەوانی**[2]: ئاوەڵـناو. ئەرغـەوانی؛ بـە ڕەنگـی ئەرغەوان ‹کراسی ئەرخەوانی› ☰ ارغوانی

**ئەرخـەیان** / erxeyan/: ئاوەڵـناو. ئارخـەیان؛ خاترجەم؛ بێخەم ☰ مُطمئن

**ئەرخین** / erxîn/: چاوگ. ماندوو/ شـەکەت بـوون ☰ خسته شدن

**ئەرد** / erd/: ☜ **ئەرز ـ۱**

**ئەردە** / erde/: نـاو. ئـاردە؛ کـرەکونجی؛ کـونجی هاڕدراو ☰ ارده

**ئەردەڵ** / erdeɫ/: نـاو. بوێر؛ بەجـەرگ؛ نـەترس ☰ شُجاع

**ئەردەوان** / erdewan/: نـاو. ۱. ئاشەوان؛ ئاسـیاوان ۲. چاودێری زەوی و زار ☰ ۱. آسیابان ۲. نگهبـان مزرعه

**ئەردهەژ** / erdhej/: ناو. ئـەردهێژ؛ بوومەلـەرزە ☰ زلزله

**ئەردهێژ** / erdhêj/: ☜ **ئەردهەژ**

**ئەرز** / erz/: ناو. ۱. ئەرد؛ عەرد؛ زەوین؛ زەوی ‹بە سەر ئەرزا ئەگەر نازیش بکـەن هەقتانـە هـەر وا بـێ/ تەماشای سێبەری ئەم شاخ و کێوانـەی لـە سـەرتانە «ئەحمەد موختار جاف»› ۲. پوولی بیانی؛ پـارەی وڵاتانی تر ☰ ۱. زمین ۲. ارز

**ئەرزان** / erzan/: ☜ **هەرزان**

**ئەرزش** / erziş/: ناو. بایەخ؛ ئۆرت ☰ ارزش

**ئەرزن** / erzin/: ☜ **هەرزن**

**ئەرزناس** / erznas/: ناو. زەویناس ☰ زمین‌شناس

**ئەرزناسـی** / erznasî/: نـاو. زەویناسـی ☰ زمین‌شناسی

**ئەرزنج** / erzinc/: ناو. ئانیشک؛ ئەنیشک ☰ آرنج

**ئەرزنگ** / erzing/: ☜ **ئەرزینگ**

**ئەرزنی** / erz(i)nî/: ناو. جۆرێ هـەنجیر ☰ نـوعی انجیر

**ئەرزەن** / erzen/: ☜ **ئەرزینگ**

**ئـەرزینگ** / erzîng/: نـاو. ئارزینـگ؛ ئارگوشـک؛ ئارگووشک؛ ئەرزێنک؛ ئـەرزنگ؛ ئـارزەن؛ ئـارزن؛ ئەرزەن؛ ئارچەن؛ چەنە؛ لەچەنە؛ چەنەگە؛ چەناگە ☰ زنخ؛ چانه

**ئەرزێنک** / erzênik/: ☜ **ئەرزینگ**

**ئەرژن** / erjin/: نـاو. هەرجن؛ ناوی دارێکە بەرێکی

وەک بادام دەگرێ و بۆ دەرمان دەبێ ☲ درختی است

**ئەرژنگ** / erjing/: ناو. دارێکە لە ئەرخەوان دەکا ☲ درختی شبیه ارغوان

**ئەرژەنگ** / erjeng/: ناو. غوول؛ دێو ☲ غول

**ئەرس** / ers/: ناو. هەرس؛ فرمێسک؛ ئەسرین ☲ اشک

**ئەرش** / erş/: ناو. تەشق؛ عەرش؛ بەرزایی ئاسمان ☲ عرش

**ئەرشیڤ** / erşîv/: ناو. ۱. شوێنی ڕاگرتنی بەڵگە و پەرتووک ۲. خەزێنەی بەڵگەیان ☲ ۱و۲. آرشیو

**ئەرغو** / erğû/: ☜ ئەرخەوان

**ئەرغەنوون** / erğenûn/: ناو. چەشنێک ئۆرگی دەستی کۆن (ئامرازی مووسیقا) ☲ ارغنون

**ئەرغەوان** / erğewan/: ☜ ئەرخەوان

**ئەرغەوانی** / erğewanî/: ☜ ئەرخەوانی

**ئەرڤا** / erva/: ئاوەڵناو. چوست و چالاک؛ گورج و گۆل ☲ چابُک

**ئەرڤاز** / ervaz/: ☜ هەوراز

**ئەرک** / erk/: ناو. ۱. خەسپەن؛ ڕاسپێری؛ کار، ئاکار یان ڕاژەیێ کە لە یەکێک (بە هۆی بوون لە نێو تاقمێک) چاوەڕوانی دەکرێ ۲. ئەرکی سەرشان؛ ئەوەی ئەخلاق یان قانوون بۆ مرۆڤی دەبڕێتەوە ۳. بەرپرسی؛ بەرپرسایەتی؛ بەرپرسیەتی؛ لێ پرسراوی؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی بەرپرس بوون ‹ئەرکی ئەم قوتابخانە لە سەر ئێوەیە؟› ٤. زەحمەت؛ ڕەنج ‹نە کای بۆ بێنە، نە جێی بماڵە/ هیچ ئەرکیان نییە ئەو دووگەماڵە! «قانع»› ☲ ۱و۲. وظیفه ۳. مسئولیت ۴. زحمت

**ئەرکان** / erkan/: ناو. ڕەخت و ئەسپابی شەڕ ☲ جنگ‌افزار

**ئەرکگران** / erkg(i)ran/: ئاوەڵناو. ڕەنجدەر؛ زەحمەتکێش ☲ رنجبر

**ئەرکگرانی** / erkg(i)ranî/: ناو. داب و دەستووری تایبەت و زیاد لە ڕادەی ئاسایی بۆ بەڕێوە بردنی ڕەسم و یاسایەکی دیاریکراو ☲ تشریفات

**ئەرکەتی** / erketî/: ☜ ئەگەر[۲]

**ئەرکەتێ** / erketê/: ☜ ئەگەر[۲]

**ئەرمانای** / ermanay/: چاوگ. شاندان؛ نیشاندان؛ نواندن ☲ نشان دادن

**ئەرمەنی** / ermenî/: ☜ هەرمەنی

**ئەرنا** / erna/: ئاوەڵکار. ئەگەرنا؛ ئەگەر وا نەبێ ‹شمشاڵێکی زەرد لە تۆی پشتێنی/ مەر چاک تێفکری، ئەرنا نایبینی «قانع»› ☲ وگرنه

**ئەرناڤ** / ernav/: ناو. قین؛ ڕق ☲ کینه

⊡ **ئەرناڤ لێچوون**: ڕق نیشتنەوە؛ ئارام بوونەوە ☲ عصبانیت فروکش کردن

**ئەرناندن** / ernandin/: چاوگ. ۱. زویر کردن ۲. عەزیەت کردن ☲ ۱. آزُردن ۲. اذیت کردن

**ئەرنۆ** / erno/: ئاوەڵناو. ئەرنۆک؛ ڕقئەستوور؛ قینەوون ☲ کینه‌توز

**ئەرنۆک** / ernok/: ☜ ئەرنۆ

**ئەرنە** / erne/: ئاوەڵناو. ڕسوا ☲ رسوا

**ئەرنین** / ernîn/: چاوگ. تووڕە بوون؛ بێزار بوون ☲ بیزار شدن

**ئەروا** / erwa/: ناو. گیان؛ ڕۆح ‹قاڵبم بێ ڕۆح ئەروام نەمەندەن/ مەن دان حەیات زندەگیم کەندەن «مەولەوی»› ☲ جان

**ئەرواز** / erwaz/: ☜ هەوراز

**ئەرواو** / erwaw/: ناو. ئاغا؛ ئاغادێ؛ خاوەن مولک ☲ ارباب

**ئەرەبەستە** / erebeste/: ئاوەڵناو. پەروار؛ دابەستە ☲ پرواری

**ئەرەج** / erec/: ناو. مەچەک؛ جومگە؛ بەندی نێوان پەنجە و باسک ☲ مُچ

**ئەرەجیای** / erec(i)yay/: چاوگ. وا زانین ☲

پنداشتن

**ئەرەچکەی / ereç(i)key/:** چاوگ. تکان؛ تکیان ☰ چکیدن

**ئەرەقگیر / ereqgîr/:** ☜ ئارەقگیر

**ئەرەمتەی / erem(i)tey/:** چاوگ. ڕژاندن؛ ڕژانن ☰ ریختن

**ئەرەمەردەی / eremerdey/:** چاوگ. داسەکنان؛ هەدا دان؛ ئارام بوون ☰ آرام شدن

**ئەرەوەسای / erewesay/:** چاوگ. داخوەستن؛ داوەزین؛ دابەزین ☰ پیاده شدن

**ئەرێ[1] / erê/:** ناو. بەڵێ؛ با ‹کچەکەیان ئەرێی گوتووە؛ ئەرێیان لێسەند› ☰ آری

**ئەرێ[2]:** ئاوەڵکار. ۱. بەڵێ؛ ئا ‹لە ڕێم وەستاوی؟ ئەرێ› ۲. *[سەرزارەکی]* ئاخۆ؛ داخۆ ‹ئەرێ هاتەوە؟› ☰ ۱. آری ۲. آیا

**ئەرێ[3]:** ئامراز. وشەی سەرنج ڕاکێشانی لایەنەکانی وتوویژ ‹ئەرێ وتیان شت هەرزان دەبێ!؛ ئەرێ چۆنی؟› ☰ راستی

**ئەرێ[4]:** دەنگ. ۱. هەی ‹ئەرێ ئەی شێخە پیسەی بۆری چلکن!/ ئەرێ ئەی زک هەمانەی غازی بۆگن! «مەلای گەورە»› ۲. بەڵێ؛ وایە ☰ ۱. هان؛ ای ۲. آره

**ئەرێ نەرێ / erê nerê/:** سارستە. دوودڵی و ڕاڕایی؛ بکرێنەکرێ ☰ بشود نشود

**ئەرێنی / erênî/:** ئاوەڵناو. پۆزەتیڤ؛ موسبەت ☰ مُثبت

**ئەڕا[1] / eřa/:** ناو. مشار؛ هەرە ☰ اره

**ئەڕا[2]:** ئاوەڵکار. بۆچی: ۱. چما؛ لە بەر چی ‹ئەڕا ئیجووری کەی؟› ۲. مەگەر ‹ئەڕا قوڕواخم وە ئاو چاخ بووم؟!› ☰ ۱. چرا ۲. مگر

**ئەڕا[3]:** ئامراز. ئەڕای؛ بۆ؛ لە بەر ‹بزن ئەڕا یەی شەو جێ خوەی خوەش کەی «پەند»› ☰ برای

**ئەڕابە / eřabe/:** ناو. عەرەبانە؛ ئارەبانە؛ ئارەوانە ☰ گاری

**ئەڕای / eřay/:** ئامراز. بۆ؛ ڕای ☰ برای

**ئەڕدێن / eřdên/:** ☜ ڕدێن

**ئەڕزاق / eřzaq/:** ناو. تفاق؛ ئازووخە؛ ئازووقە ☰ آذوقه

**ئەڕفای / eřfay/:** چاوگ. ڕفاندن؛ پڕ پێدا کردن ☰ ربودن

**ئەڕنەموتە / eřnemûte/:** ناو. زەڕنەقووتە؛ قامکی ناوەڕاست ☰ انگشت وسط

**ئەڕۆ / eřo/:** ☜ ئەمڕۆ

**ئەڕە / eře/:** ☜ هەرە[1]ـ۱

**ئەز / ez/:** جێناو. من؛ م ‹ئەگەر دیتیانم ئەزم، ئەگەر نەیاندیم دزم! «مەسەل»› ☰ من

**ئەزازیل / ezazîl/:** ناو. خووسار؛ زوقم ☰ سرماریزه

**ئەزبۆلە / ezbole/:** ☜ هەزبێ

**ئەزبەر / ezber/:** ناو. دەرخ؛ لە بەر ☰ از بر؛ حفظ

**ئەزبەنی / ezbenî/:** جێناو. بەنەنە؛ بچووکتان؛ وشەی ڕێز نان لە کەسی بەرامبەر، واتا من کۆیلەم ☰ بنده؛ جان‌فدا

**ئەزبێ / ezbê/:** ☜ هەزبێ

**ئەزبێکێویلە / ezbêkêwîle/:** ☜ هەزبیەکێویلە

**ئەزبێڵە / ezbêłe/:** ناو. نەعنا؛ جاترە ☰ نعناع

**ئەزرۆ / ezro/:** ☜ ئارەزوو

**ئەزرەتمەن / ezretmen/:** ئاوەڵناو. بەئاوات ☰ آرزومند

**ئەزم / ezm/:** ☜ هەزم

**ئەزمان / ezman/:** ناو. ۱. ئاسمان؛ عاسمان ‹وەک ستێرکا لە ئەزمانی› ۲. زمان؛ زوان ☰ ۱. آسمان ۲. زبان

**ئەزمانتاڵ / ezmantał/:** ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ئەزمانڕەش؛ دەمپیس؛ زمانپیس ☰ بدزبان

**ئەزمانڕەش / ezmanřeş/:** ☜ ئەزمانتاڵ

**ئەزموو / ezmû/:** ئاوەڵناو. ئەزموودە؛ تەجرەبەکراو؛

هەڵسەنگێنراو ⚑ آزموده

**ئەزموودە** / ezmûde/: ☜ **ئەزموو**

**ئەزموون** / ezmûn/: ناو. کار و ڕەوتی هێچان؛ تاقی کردنەوە؛ جەرباندن ⚑ آزمون

**ئەزموونگە** / ezmûnge/: ناو. زموونگـە؛ تاقیگـە؛ دامەزراوەیـەک بـە کەرەسـەی پێویسـتەوە بـۆ ئـەنجام دانی ئـەزموونی زانسـتی و پیشـەیی ⚑ آزمایشگاه

**ئەزمین** / ezmîn/: چاوگ. ١. تام کردن؛ چەشتن؛ چێژ کردن ٢. زمین؛ سەنگاندن ⚑ ١. مزه کـردن ٢. آزمودن

**ئەزمێن** / ezmên/: ☜ **ئاسمان**

**ئەزوا** / ezwa/: ناو. عەزوا: ١. سیبری؛ دەرمانێکی تاڵە ٢. ئەزوێڵە؛ بەهارات؛ ئالات و ئیسۆت؛ ئـەدوا و گیای بۆنخۆشی چێشت ⚑ ١. الوا ٢. ادویه

**ئەزوێڵە** / ezwêłe/: ☜ **ئەزوا-٢**

**ئـەزەل** / ezel/: نـاو. ئـەزەل؛ ڕێڤـگە؛ سـەرەتا: ١. کـاتی بـێدەسـپێک کـە هـەر بـووە ٢. */فەلسەفە/* بێسەرەتا؛ ئەوەی هەر بووە و هەر دەبێ؛ ئەو شتە کە دەسـپێکی نـەبێ یـان بـوونی هەمیشـەیی و هەتاـ هەتاییە ⚑ ١و٢. ازل

**ئـەزەلی** / ezelî/: ئاوەڵـناو. ئەزەڵـی؛ هـەربوو؛ هەربووگ؛ بێپێشینە ⚑ ازلی

**ئەزەڵ** / ezeł/: ☜ **ئەزەل**

**ئەزەڵی** / ezełî/: ☜ **ئەزەلی**

**ئەزیەت** / ezyet/: ناو. ئازار؛ عەزیەت ⚑ آزار

⊡ **ئەزیەت کردن:** ڕەنج و ئازار پێ گەیاندن ⚑ اذیت کردن

**ئەزیەت کێشان:** تووشـی ڕەنـج و ئـازار بـوون ⚑ زحمت کشیدن

**ئەژار** / ejar/: نـاو. خەرمان؛ شوێنی کۆ کردنەوەی دەغڵ و دان ⚑ خرمن

**ئەژدا** / ejda/: ☜ **ئەژداد**

**ئەژداد** / ejdad/: ناو. ئەژدا؛ ئاژدا؛ باپیران ⚑ نیاکان

**ئەژدەر** / ejder/: ☜ **ئەژدیها**

**ئەژدەها** / ejdeha/: ☜ **ئەژدیها**

**ئەژدیها** / ejdîha/: ناو. ئەژدەها؛ ئژدەها؛ ئـەژدەر؛ حەزیا؛ زەهـا؛ هـەژدەها؛ هـەژدیها؛ حـەفی؛ زیـا؛ هەزیا؛ عەزیا؛ زهار؛ زهاک؛ هەردیا؛ هووها؛ حەی؛ ڤژاف؛ هەیڤی؛ ئەلهوو؛ هەلهووت؛ ماری گـەورەی چیرۆکـان کـە لـە دەمیـەوە ئـاگر دەبـارێ، بـاڵ دەگرێتەوە و زیان دەگەیێنێ ⚑ اژدها

**ئەژمار** / ejmar/: نـاو. ١. شمارە؛ ژمارە ٢. ئامار ⚑ ١. شُمارە ٢. آمار

**ئەژمارتن** / ejmartin/: ☜ **ئەژماردن**

**ئەژماردن** / ejmardin/: چاوگ. ئەژمارتن؛ ژماردن؛ بژاردن ⚑ شمُردن

**ئـەژماردە** / ejmarde/: ئاوەڵـناو. ١. ژمێـردراو؛ بژێردراو ٢. هەڵبژێراو؛ هەڵبژاردە ⚑ ١. شـمُردە ٢. مُنتخب

**ئەژمارە** / ejmare/: ☜ **ژمارە**

**ئەژماه** / ejmah/: ☜ **ژمارە**

- **ئەژمێر** / ejmêr-/: پاشەوشە. ـ ژمێر ⚑ ـ شُمار

**ئەژناس** / ejnas/: ناو. ئاشنا؛ ناسیاو ⚑ آشنا

**ئەژنۆ** / ejno/: نـاو. ژنـۆ؛ ژەنـوو؛ وژینـگ؛ وژنـگ؛ هـەژنۆ؛ هژنـوو؛ زەنگـۆڵ؛ ئـەژنوو؛ هژنـێ؛ وژنـێ؛ ژوونی؛ ورزنگ؛ وێرزنگ؛ وژدنگ؛ هژدنـگ؛ ورژن؛ وێژنی؛ زانۆ؛ زانـوو؛ زرانـۆ؛ زانی؛ زرانی؛ هـەنگۆڵ؛ چۆک؛ کورک؛ قچ؛ جمگەیێ لە پـای مـرۆڤ، لـە نێـوان ئێسـکی ڕان، کەشـکەوژنگ (کلاوەژنـۆ) و بەلەکدا ⚑ زانو

⊡ **ئەژنۆ پێ دادان:** */کینایە/* شکست پـێ دان؛ کـۆڵ پێ دان ⚑ تسلیم کردن

**ئەژنۆ دادان:** ١. لـە سـەر چـۆک دانیشـتن ٢. */کینایە/* تێکشکان و کۆڵ دان ⚑ ١. بر روی زانو نشستن ٢. تسلیم شدن

**ئەژنۆ شکان:** *[کینایە]* بەلای گەورە بە سەردا هاتن ▣ دچار مُصیبت بزرگ شدن

**ئەژنۆ شل بون:** ماندوو بوون بە هۆی ڕاوەستان و گەڕانی زۆرەوە ▣ خستە شدن

**ئەژنۆڕوتە** / ejnořûte/: ناو. زەرنەقووتە؛ دۆلەدرێژە؛ بالابەرزە؛ قامکی ناوەڕاست ▣ انگشت وسطی

**ئەژنو** / ejnû/: ☜ **ئەژنۆ**

**ئەژنەفتن** / ejneftin/: ☜ **ئەژنەوتن**

**ئەژنەوای** / ejneway/: چاوگ. ژنەوتن؛ شنەفتن؛ بیستن ▣ شنیدن

**ئەژنەوتن** / ejnewtin/: چاوگ. ئەژنەفتن؛ ئەژنەویەی؛ بیستن؛ گوێ لێبوون؛ ژنەوتن؛ ژنەفتن ‹تا گەر ئەژنەون دەنگ داومان/ کەس بار نیەیتەری وە ئاسیاومان «فولکلۆر»› ▣ شنیدن

**ئەژنەویەی** / ejnewyey/: ☜ **ئەژنەوتن**

**ئەژنیەی** / ej(i)n(i)yey/: چاوگ. ١. ژنەوتن؛ شنەفتن؛ بیستن ٢. داخستن؛ بەستن ▣ ١. شنیدن ٢. بستن

**ئەسارە** / esare/: ناو. هەسارە؛ ئەستێرە ▣ ستارە

**ئەساس** / esas/: ناو. بنەڕەت؛ بنچینە؛ بناخە؛ بناغە ‹زۆر چاک دایمەرزان ئەساسی شایی/ بناغەی خوێندن، سوارەی سپایی «قانع»›. هەروەها: **ئەساسی** ▣ اساس

**ئەساسیە** / esas(i)ye/: ناو. کەلوپەلی ناومال ▣ اثاثیە

**ئەسانای** / esanay/: ☜ **ئەسای**

**ئەساوی** / esawî/: ناو. خرید؛ کاری سەندن؛ کڕین ▣ خرید

**ئەسای** / esay/: چاوگ. ئەسانای؛ کڕین؛ سەندن؛ ساندن ▣ خریدن

**ئەسپ** / esp/: ناو. هەسپ؛ حەسپ: ١. یاو؛ مال؛ چروە؛ گیانەوەرێکی ئالفخۆری چارواپە ڕەگەز و ناوی جۆراوجۆری هەیە ٢. یەکێ لە مۆرەکانی شەترەنج ▣ ١و٢. اسب

▣ **ئەسپی ئاوی:** فستون؛ گیانەوەرێکی ئالفخۆری زۆر گەورەی دەست و پێ کورتە لە ئەفریقا، لە پەنای چۆم و ڕووباراندا دەژی ▣ اسب آبی

**ئەسپی بێلغاو:** *[کینایە]* سەرەڕۆ ▣ سرکش

**ئەسپی تۆش:** چارەوای لەقەهاوێژ و قەپگر ▣ اسب چموش

**ئەسپی خۆشبەز:** ئەسپی خۆشڕەوت؛ ئەسپی بەکار و ئازا کە درەنگ ماندوو دەبێ ▣ اسب رهوار

**ئەسپی خۆشڕەوت:** ☜ **ئەسپی خۆشبەز**

**ئەسپی ڕاست:** ئەسپێ کە لاقێکی ڕەش و سێ لاقی سپی بێ ▣ اسب راست

**ئەسپی ڕەسەن:** ١. کەهێل؛ کحێل؛ کەحلان؛ ئەسپێ چاک ٢. ئەسپی بە ڕەسەنی ناسراوەوە (وەک: ئەسپی عەرەبی) ▣ ١و٢. اسب اصیل

**ئەسپی ڕەوەک:** ئەسپێ کە ئەگەر لەغاوی بەر بێ، بۆ کەس ناوەستێ و هەڵدێ ▣ اسب رموک

**ئەسپی شا:** ئەسپی شەترەنج، ئەوی لە شا نزیکترە ▣ اسب شاه

**ئەسپی شێ:** ئەسپێک کە هەموو لەشی ڕەنگی خورمایی ئاچخ بێ ▣ اسب کرنگ

**ئەسپی قەرەکوێت:** ئەسپی ڕەشکوێت، ئەسپی کوێتی مەیلەو تاریک ▣ اسب قرەکَهَر

**ئەسپی کوێت:** ئەسپێ کە یال و کلکی مەیلەوڕەشی تۆخ یا ڕەش بێ ▣ اسب کَهَر

**ئەسپی وەزیر:** ئەسپی شەترەنج، ئەوی لە وەزیر نزیکترە ▣ اسب وزیر

▣ **ئەسپ هەڵگرتن:** ١. تاودانی ئەسپی سەرکێش و گوێ نەدانی بە سوار ٢. *[کینایە]* زێدەڕۆیی کردن و تام تێدا نەهێشتن ▣ ١. اسب برداشتن ٢. تُرمُز بریدن

**ئەسپا** / espa/: ئاوەڵـناو. هەسـپا؛ لەسـەرخۆ ☰ آهسته

**ئەسپاب** / espab/: ناو. هەسپاو؛ ئامراز؛ کەلوپەل ‹واچـە یەنـد زووخـاو دەروونـش وەردەن/ ئەسـپاب مەردەن ئامادە کەردەن «مەولەوی»› ☰ اسباب

**ئەسپاراى** / esparay/: چاوگ. سپاردن ☰ سپُردن

**ئەسپاردن** / espardin/: چـاوگ. ١. شـتێ یـان کەسێ بە ئەمانەت دانان ٢. وەڵامی قسـەیەک بـۆ کەسێک ناردن ☰ ١. سپُردن ٢. پاسخ فرستادن

**ئەسپاردە** / esparde/: نـاو. سـپاردە؛ ئەسـپێراو؛ قەوینتیکری؛ بە ئامانەتی داندراو ☰ سپُرده

**ئەسپاردەیی** / espardeyî/: ئاوەڵـناو. سـپاردەیی؛ سپارەیی ☰ سفارشی

**ئەسپاریای** / esparyay/: چـاوگ. سـپێردران ☰ سپُرده شدن

**ئەسپاو** / espaw/: ناو. ١. ئەسپاب ٢. *[مەجاز]* گەڵ و گون ☰ ١. اسباب ٢. عورت مرد

⊡ **ئەسپاو حمام:** *[مەجاز]* شت و کەسی بـێنـرخ ☰ وسیله و آدم بیارزش

**ئەسپایی** / espayî/: ئاوەڵـکار. ئاسپایی؛ هێواش؛ لە سەرخۆ ☰ یواشکی

**ئەسپس** / espis/: ☜ **ئەسپست**

**ئەسپست** / espist/: ناو. ئەسپس؛ وێنجە ☰ یونجە

**ئەسپسوار** / esps(i)war/: نـاو. سـوار؛ سـواری حەسپ ☰ اسبسوار

**ئەسپسواری** / esps(i)warî/: ناو. ١. کـار و ڕەوتی سواری ئەسپ بوون و لێخـوڕینی ٢. کێبـەرکێی بە ئەسپ ☰ ١و٢. اسبسواری

**ئەسپشێ** / espişê/: ☜ **ئەسپێ**

**ئەسپڵ** / espił/: ☜ **ئەسپوول**

**ئەسپندار** / espindar/: ☜ **سپیدار**

**ئەسپنگ** / esping/: ناو. ئەسپینگ؛ شنگ ☰ شنگ

**ئەسپۆڵ** / espoł/: ☜ **ئەسپوول**

**ئەسپۆن** / espon/: نـاو. سـپۆن؛ سـەونچک؛ بنـە گیای بە کەف بۆ جل و دەس شتن ☰ چوبک

**ئەسپوول** / espûl/: ناو. ئەسـپڵ؛ سـپڵ؛ ئەسـپۆڵ؛ فاتەڕەشک؛ گورگـنەخۆرە؛ ئەندامێکی لووئاسا لـە سەرووی لای چەپی گەدەوە کـە کـاری لـە نێـو بردنی خڕۆکە سوورە پیرەکانی خوێن و دروسـت کردنی خڕۆکەی تازەیە ☰ سپُرز؛ طحال

**ئەسپە** / espe/: ناو. سووریجە؛ سووریژە؛ نەخۆشی زارۆکانە بە تای توندەوە زیپکەی وردی سـووریان لێ دێ ☰ سُرخک

**ئەسپەئاسنینە** / espe'as(i)nîne/: ناو. ئەسپەدارینە؛ دووچەرخە ☰ دوچرخه

**ئەسپەدارینە** / espedarîne/: ☜ **ئەسپەئاسنینە**

**ئەسپەر** / esper/: ناو. ئەسپەرە: ١. جێگە پـێ لـە پێمـەڕەدا ٢. سـپەر؛ قەڵـغان ٣. گێنـوو؛ گێنـۆ؛ گینگۆ؛ وڕەبۆزە؛ زەرتک؛ وڕەبۆسـقە؛ وڕەبۆسـکە؛ بوڕەبۆسقە؛ گیایەکە لە بنەماڵەی پنگ، گەڵاکانی پـان و بڕاوبـڕاوە؛ لاسـکەکەی توێژاڵـێ تـووکی پەمووی پێوەیە، خونچەکـەی خـڕی درێژۆکەیـە بەلام یەکپارچە تووکی پەمووە، ڕەگ و بنکەکەی بۆ ژانی ئێسک و خاو کردنەوەی ماسوولکەکان بە کاردێت ☰ ١. جای پا در بیل ٢. سپر ٣. سنبل بیابانی پارەبرگ

**ئەسپەردە** / esperde/: ناو. ١. سپاردە؛ ئەسـپێراو؛ قەوینتیکری؛ بە ئامانەتی دانـدراو ٢. کـاری بـە خاک سپاردن؛ ناشتن ☰ ١. سپُرده ٢. دفن

⊡ **ئەسپەردە کردن:** ناشتن؛ نیانە قەور ☰ دفن کردن

**ئەسپەرە** / espere/: ناو. ١. ☜ **ئەسپەر** ٢. پارچە دارێکـە دەخرێتـە نێـوان مـیچ و کۆڵـەکەوە ٣. گێنوو؛ گیایەک لە بنەماڵەی پوونگـە، گـەڵاکانی پان و کەنارەکانی گـڕنیگڕنییـە، گوڵـی سـپی و نهۆمنهۆم، لە سەر لاسکەکەی. ڕەگ و بنکەکەی بەتایبـەت بـۆ ژان و ئێسـک و خـاو کردنـەوەی

ماسوولکەکان بەکار دێ 🇮🇷 ١. ☜ **ئەسپەر** ٢. اِسپر؛ سرستون ٣. سنبل بیابانی پارەبرگ

**ئەسپەشینە** / espeşîne/: ناو. کاسەلەشینکە؛ مێشخۆر؛ زەردەواڵەخۆر؛ باڵندەیەکی شینە بە قەد ڕیشۆڵەیەک 🇮🇷 سبزقبا

**ئەسپەک** / espek/: ناو. گرانەتا؛ سوورەیاو؛ ڕەشەگرانە 🇮🇷 تیفوس

**ئەسپەناخ** / espenax/: ناو. ئەسپەناغ؛ سپناخ؛ ئەسفەناج؛ سپەناغ؛ سپیناغ؛ گیایەکە لە بنەماڵەی چەوەندەر و سەڵمکە، گەڵاکانی پانی نووک سووچە، بە کاڵی و کوڵیوی دەخورێت 🇮🇷 اسفناج

**ئەسپەناغ** / espenağ/: ☜ **ئەسپەناخ**

**ئەسپەند** / espend/: ☜ **ئەسپەندەر**

**ئەسپەندەر** / espender/: ناو. ئەسپەند؛ قانگ؛ گیایەکە گەڵاکانی درێژ و تەسک و ئەستوور، گوڵەکانی سپی مەیلەو سوورە، تووەکەی دەسووتێنن بۆ چاوەزار و دەرمانی خەمۆکی و ئارامبەخشی 🇮🇷 اسپند

**ئەسپی** / espî/: ☜ **ئەسپێ**

**ئەسپیحەسەنحوسێنان** / espîĥesenĥusênan/: ناو. حوشترخوا 🇮🇷 آخوندک

**ئەسپیدار** / espîdar/: ☜ **سپیدار**

**ئەسپین** / espîn/: ناو. هەوڕە؛ پواز؛ دارۆکێکە دەخرێتە قەڵشی کۆلکەدارەوە تا یەک نەیەتەوە و بە تەور بیشکێنن 🇮🇷 فانە

**ئەسپیندار** / espîndar/: ☜ **سپیدار**

**ئەسپینگ** / espîng/: ☜ **ئەسپنگ**

**ئەسپێ** / espê/: ناو. ئەسپشێ؛ ئەسپی؛ ئسپێ؛ سپێ؛ هەسپێ؛ هەپش؛ هەپشێ؛ هش؛ هسپی؛ سپپی؛ سپە؛ سەپیە؛ شش؛ جوونات؛ هەشپش؛ هەشپشێ؛ هەشپشی؛ گنار؛ مێروویەکی ڕەشی چکۆلەیە لە نێو قژ و لە توێی جلوبەرگدا گەرا دەکا و گەورەی نەخۆشی بڵاو دەکاتەوە 🇮🇷 شپش

◙ **ئەسپێی قوزان**: پیاوێک کە نێو ژنانی پێخۆشە 🇮🇷 مردی کە در مجلس زنان می‌خزد

◙ **ئەسپێی تێدان**: پەیدا بوونی ئەسپێ لە لەشی مرۆڤ و دانەوێڵە و شتی وا 🇮🇷 شپش زدن

**ئەسپێخۆر** / espêxor/: ئاوەڵناو. [کینایە] چنۆک و خەسیس 🇮🇷 خسیس

**ئەسپێران** / espêran/: چاوگ. ئەسپاردە کران 🇮🇷 سپردە شدن

**ئەسپێراو** / espêraw/: ☜ **ئەسپاردە**

**ئەسپێکوژە** / espêkuje/: ناو. سپێکوژە؛ تبلامەزن؛ سپییەکوژە؛ قامکەزلە؛ قامکەگەورە؛ کلکەگەورە؛ کەلەموست؛ کەلەئەموست؛ کەلەئەنگوست؛ پنجەگەورە؛ هەپشەکوشێ؛ تلیابەرانکێ؛ یەکەمین و قەڵەوترین قامکی دەست 🇮🇷 انگشت شست

**ئەسپێون** / espêwin/: ئاوەڵناو. سپێون؛ ڕشکن؛ ڕشکاوی؛ ڕشکۆ؛ ششوو 🇮🇷 شپشو

**ئەستانای** / estanay/: ☜ **ئەستاندن**

**ئەستاندن** / estandin/: چاوگ. ستاندن؛ ئەستانای: ١. وەرگرتن ‹بە منداڵی لە لێوی ئاڵی تۆم ئەستاندووە ماچێ/ بە پیریش لەززەتی ئەو ماچە شیرینەم لە بیر ناچێ «هێمن»› ٢. داگیر کردن 🇮🇷 ١. گرفتن ٢. اشغال کردن

**ئەستاندنەوە** / estand(i)newe/: چاوگ. ١. ساندنەوە؛ وەرگرتنەوە ٢. قەرەبوو کردنەوە 🇮🇷 ١. بازپس گرفتن ٢. جبران کردن

**ئەستر** / estir/: ☜ **هێسر**

**ئەستران** / est(i)ȓan/: ناو. ستران؛ گۆرانی 🇮🇷 ترانە

**ئەستری** / est(i)ȓî/: ناو. درک؛ درووْ؛ چقڵ؛ تیکان 🇮🇷 خار

**ئەستریلک** / est(i)ȓîlik/: ☜ **ئەستریلك**

**ئەسترێلک** / est(i)rêlik/: ناو. ئەستریلک؛ ئەسریلک؛ ئەسرێلک؛ سرێش؛ چرێش؛ گیایەکی کوێستانییە بە گەڵای درێژ و تەسک و ئەستوور،

گوڵێ درێژووکەی سپی، ئاڵ، زەردی بەرەو سەوز، بنک و ڕەگی ئەستوور و لینج، کە وشکی دەکەن و دەیهاڕن و بۆ چەسپی سرێش بەکاری دێنن. بەهارانە گەڵاکانی بە جوانی دەبڕن بۆ گیای دۆکولیو و چێشتی تر ☰ سریش

**ئەستڕان** / est(i)řan/: ☜ **ئەستڕین**

**ئەستڕین** / est(i)řîn/: چاوگ. ئەستڕان؛ ئەستڕینەوە: ١. سڕین؛ماڵین و پاک کردنەوەی پەڵە بە پەڕۆ ٢. وشک کردنەوەی تەڕ ☰ ١. سُتردن ٢. خُشک کردن

**ئەستڕینەوە** / est(i)řînewe/: ☜ **ئەستڕین**

**ئەستنگ** / esting/: ناو. ١. زەردەواڵە؛ زەرگەتە ٢. چووزەی هەنگ و زەردەواڵە و مۆز و زەرگەتە و... ٣. پلە بەردینەی شاخ ☰ ١. زنبور ٢. نیش زنبور ٣. پلەهای سنگی کوه

**ئەستورک** / esturik/: ☜ **ئەستورك**

**ئەستوگوردە** / estugurde/: ☜ **ئەستوکوردە**

**ئەستون** / estun/: ☜ **ئەستوون**

**ئەستوند** / estund/: ☜ **ئەستوون**

**ئەستوندەک** / estundek/: ناو. ئەستوونەک؛ داری کۆڵەکەی خێوەت و ڕەشماڵ ☰ ستون خیمە

**ئەستوندەکی** / estundekî/: ئاوەڵناو. ستوونی؛ قیت ☰ عمودی

**ئەستونگ** / estung/: ☜ **ئەستوون**

**ئەستوێلک** / est(i)wêłik/: ☜ **ئەستێوڵك**

**ئەستۆ** / esto/: ناو. هەستوو؛ هوستوو؛ هەستۆ؛ هستو؛ هەستو؛ مل؛ گەردن؛ ستۆ؛ ئەستوو: ١. بەرزایی نێوان شان و سەر ‹دەستم کە لە سەد جێگە بە سەد وەعدە شکاوە/ جەبری نییە ئەم کەسرە هەتا نەیخەمە ئەستۆ «نالی»› ٢. /کینایە/ عۆدە؛ گەردن؛ پا ‹ئەم هەموو کارە لە ئەستۆی من؟› ☰ ١. گردن ٢. عهدە

⊡ **ئەستۆ شکان:** ١. زیان پێ گەیاندن ٢. زیان پێ گەیشتن ☰ ١. زیان زدن ٢. زیان دیدن

**ئەستۆئەستور** / esto'estûr/: ناو. /پەلار/ گامل؛ ملپان ☰ گردن‌کلفت

**ئەستۆبەند** / estobend/: ناو. تۆق؛ گەردانە؛ ملبەند ‹بنازم من بە کوفری زوڵفی تۆ ئەی ئافەتی ئیسلام/ کە ئەستۆبەندی جیزیەی خستە مل ئیمانی خاس و عام «مەحوی»› ☰ گردنبند

**ئەستۆکەچ** / estokeç/: ئاوەڵناو. خزمەتکار و بەرفەرمان؛ دیل ‹لە حاست تۆ ئەستۆکەچە و چۆن بفەرمووی وا دەکەم› ☰ دست‌بەسینە

**ئەستۆگر** / estogir/: ناو. قەبال؛ دەستەبەر؛ بەڵێندار ☰ مُتعهد

**ئەستۆن** / eston/: ☜ **ئەستوون**

**ئەستۆنگ** / estong/: ☜ **ئەستوون**

**ئەستو** / estû/: ☜ **ئەستۆ**

**ئەستور** / estûr/: ئاوەڵناو. ستوور؛ قەبە؛ قۆڵ؛ قەبا؛ قەوی؛ قایم؛ قەیم؛ قەڵەو؛ کلفت؛ کولوفت؛ کەڵەفت؛ جەبلە؛ قەپە؛ قالەن؛ گیز؛ گیف؛ قەڵەتێن؛ گەزارەدار؛ گازارەدار؛ بە کۆتەری زۆرەوە ‹داری ئەستوور› ☰ کُلُفت؛ ستبر

⊡ **ئەستور بون:** پەنەمان؛ ماسین ☰ آماسیدن

**ئەستوران** / estûran/: ناو. ڕیسی ئەستوور کە دەکرێتە گورێس ☰ رسن

**ئەستورایی** / estûrayî/: ناو. ڕادەی ئەستووری ‹ئەستوورایی دارەکە دوو هامێز دەبوو› ☰ ضخامت

**ئەستورک** / estûrik/: ناو. ئەستوورکە؛ ئەستورک؛ کوللێرە؛ کولێرە؛ نانی خڕکەڵەی ئەستوور ☰ گردەنان

**ئەستورکە** / estûrke/: ☜ **ئەستورك**

**ئەستوری** / estûrî/: ناو. ستووریە؛ قەبەیی؛ قەبایی؛ کولوفتی ☰ کُلُفتی

**ئەستوکوردە** / estûkurde/: ☜ **ئەستوگوردە**

**ئەستوگوردە** / estûgurde/: ناو. ئەستووکوردە؛

ئەستوگوردە؛ پشتمل؛ بۆقمل؛ پشتگەردن ≣ قفا

**ئەستوون** / estûn/: ناو. کۆلەکە؛ ستوون؛ ئەستونگ؛ ئەستۆنگ؛ ئەستون؛ ئەستۆن؛ ئەستوند؛ ئەستوونە؛ دار یان بەردی درێژ کە وە بەر بانی دەدەن ≣ ستون

**ئەستوونە** / estûne/: ☚ ئەستوون

**ئەستوونەزێڕینە** / estûnezêřîne/: ناو. کۆلکەزێڕینە؛ کەسکەسۆر؛ کێرستون؛ پەلکەزێڕینە ≣ رنگین‌کمان

**ئەستوونەک** / estûnek/: ☚ ئەستووندەك

**ئەستەم**[1] / estem/: ئاوەڵناو. هەستەم؛ دژوار؛ ئاسێ؛ حەستەم ‹ئەم چەرخە کۆنە، ماشینەکەی ژەنگی گرتووە/ چەوری نەکا بە خوێنی مە، سووڕانی ئەستەمە! «پیرەمێرد»› ≣ دشوار

**ئەستەم**[2]: ئاوەڵکار. ئاستەم؛ سەخت؛ دژوار ‹تۆ گەل گەل کەڵگەل وە چەم مەکەردی/ پارێز پای ڕێز ئەستەم مەوبەردی «مەولەوی»› ≣ سخت؛ دشوار

**ئەستەمبوڵی** / estembułî/: ناو. ئەسەمۆڵی؛ ئەستەمووڵی؛ جۆرێ دەفری گەورەی دەم والا بۆ گرتنەوەی گێچ و... ≣ استانبولی

**ئەستەمووڵی** / estemûłî/: ☚ ئەستەمبوڵی

**ئەستەنگ** / esteng/: ☚ ئاستەنگ

**ئەستەویر** / estewîr/: ☚ ئەستێور

**ئەستەی** / estey/: چاوگ. سەندن: ١. کڕین؛ سەندن ٢. وەرگرتن ≣ ١. خریدن ٢. گرفتن

**ئەستیلان** / estîlan/: ناو. پشکیلان؛ کەڵەمستێن؛ گەمەیەکە دوو لایەنی، لایەک شتێک لە باخەڵی یەکێکدا دەشێرنەوە و جێگۆڕکێی پێ دەکەن، لایەکی‌تر بیدۆزنەوە، دەیبەنەوە ≣ نوعی بازی

**ئەستێ** / estê/: ناو. ستە؛ ستێ؛ ئاسنێکە لە بەردەستێ دەدرێ و پریشکەی لێ هەڵدەکا ≣ آهنی که به سنگ آتشزنه می‌زنند

**ئەستێر** / estêr/: ناو. ئەستێرک؛ ئەستێرک؛ ئەستێل؛ ئەستێلک؛ ئەستێڵک؛ هەسار؛ هەساری؛ هەسێرە؛ هەسێل؛ گۆل؛ پەنگاوێکی دەسکرد، بۆ ئاودێری یان تێدا مەلە کردن ≣ استخر

**ئەستێرژمێر** / estêrj(i)mêr/: ناو. جۆرێک مووروگی بریقەدارە ئەکرێتە خشڵ ≣ نوعی مُهرەی زینتی

**ئەستێرک** / estêrik/: ☚ ئەستێر

**ئەستێرکە** / estêrke/: ناو. قورخ؛ کاروانکوژە؛ ئەستێرەی ڕۆژێ ≣ ستارەی سحری

**ئەستێرۆک** / estêrok/: ناو. گۆلەستێرە؛ گوەستێرە؛ گوڵ‌ئەستێرە؛ ئەستێرۆکە؛ ستێرۆک؛ کرمێکە باڵدار، شەوانە قوونی دەترووسکێ ≣ کرم شبتاب

**ئەستێرۆکە** / estêroke/: ☚ ئەستێرۆك

**ئەستێرە** / estêre/: ناو. ئاسارە؛ ئاسێرە؛ ستێر؛ ستێرە؛ ستارە؛ هەسارە؛ هەستارە؛ ئەسارە؛ ئۆسارە؛ ئاسیرە؛ ئاستێرە؛ هەسیرە؛ هەسێرە؛ هەستێرە؛ ئەستێر؛ ئستەیرک؛ ستێرک؛ ستەیر؛ چتارە؛ هەرین؛ ئەختەر؛ هەرکام لەو تەنە گەشانەی ئاسمان کە بە شەوان دەبینردرێن ‹ئەستێرە بەرزەکان ئەدرۆشێنەوە بە شەو/ وەک چاوەکانی من نە سرەوتیان هەیە نە خەو «پیرەمێرد»› ≣ ستارە

▣ **ئەستێرەی بەخت:** *[باوەڕی کۆن]* ئەو ئەستێرانەی وەیان دەزانی ودمیان هەیە و نمانای بەختن (وەک: زوهرە و هورموز) ≣ ستارەی سعد

**ئەستێرەی بەربەیان/ بەیان:** ☚ ئەستێرەی ڕۆژێ

**ئەستێرەی داود:** نەخشێک بە شێوەی ئەستێرەی شەشپەڕ کە بۆتە درۆشمی جوو ≣ ستارەی داوود

**ئەستێرەی ڕۆژێ:** ئەستێرەی بەربەیان/ بەیان؛ ئەستێرەی کاروانکوژە؛ ئەستێرەی شوانان؛ ئەستێرەکە؛ کاروانقران؛ ناهی؛ ناهید؛ زل؛ ئەستێرکە؛ ئەستێرەقورغ؛ ئەو ئەستێرەی کە پاش نیوەشەو هەڵدێ و دە بەرەبەیاندا شەوقی لە ئەستێرەی دیکە زۆرترە ≣ ستارەی سحری

**ئەستێرەی شوانان:** ☜ **ئەستێرەی ڕۆژێ**

**ئەستێرەی شووم:** *[باوەڕی کۆن]* ئـەو ئەسـتێرانەی خەڵـک وەیـان دەزانی بـەدودمن و نمانـای شـوومین (وەک: کـەیوان و بـارام) ☰ سـتارەی نحس

**ئەستێرەی کاروانکوژە:** ☜ **ئەستێرەی ڕۆژێ**

**ئەستێرەی کشاو:** ☜ **ئەستێرەی کلکدار**

**ئەستێرەی کلکدار:** کلکەستێر؛ ئەستێرەی کشـاو؛ هەرکام لە تەنگەڵی ئاسمانی بە سەرێکی وەک هەوری ڕۆشن بە دەوری نـاوکێکی ڕووناکـەوە کە بە دەوری خۆردا دەگەڕێن و کاتێ لە خـۆر نزیک دەبنەوە، دوویەکی درەوشانیان لێ بەدی دێ ☰ ستارەی دنبالەدار

**ئەستێرەی گەنم:** مێروویەکی بچکۆلـەی قاوەییـە ☰ از حشرات

**ئەستێرەژمێر** / estêrej(i)mêr/: نـاو. مووروویـەکی سوورکاری بریسکەدارە، دەکـرێ بـە ملوانکـە ☰ مُهرەای زینتی

**ئەستێرەسۆرک** / estêresorik/: ناو. ئەسـتێرەیەکی سووری درەوشاوەیە ☰ عیوق

**ئەستێرەشناس** / estêreş(i)nas/: ☜ **ئەستێرەناس**

**ئەستێرەشەلە** / estêreşele/: نـاو. ئەسـتێرەیەکی کزە لە تەنیشت ئەستێرەی ناوەڕاستی دووهـەمی کلکی حەوتەوانانە ☰ از ستارگان خوشەی پروین

**ئەستێرەقورغ** / estêrequriğ/: ☜ **ئەسـتێرەی ڕۆژێ**

**ئەستێرەکە** / estêreke/: ☜ **ئەستێرەی ڕۆژێ**

**ئەستێرەگەر** / estêreger/: نـاو. بەختـزان؛ کەسـێ کە لە ئەستێران دەڕوانێ و چارەنووسـی خەڵـکی تێدا دەبینێ ☰ طالع‌بین

**ئەستێرەگەری** / estêregerî/: نـاو. ئەسـتێرەگەڕی؛ بـەختزانی؛ کـاری ڕوانـین لـە ئەسـتێران و دیتنـەوەی چارەنووسـی خەڵـکی تێـدا ‹ئەستێرەگەری دەکرد لە چالا/ چارەی ڕەشی خـۆی دەدی لە خالا «هەژار، *مەم و زین*»› ☰ طالع‌بینی

**ئەستێرەگەڕی** / estêreğerî/: ☜ **ئەستێرەگەری**

**ئەستێرەناس** / estêrenas/: نـاو. ئەستێرەشـناس؛ هەسارەشـناس؛ هەسـارەگەڕێن؛ هەسـارەناس؛ نجوومگـەر؛ شـارەزای زانسـتی ئەستێرەناسـی ‹گومانی ئەوسام ئێستە یەقینە/ ئەستێرەناسی هەموو جیهـانیش بـە گژمـدا چـن/ ئەسـتێرەکانی دنیـای هەنـدەران/ قـەت لـە ئەسـتێرەی کوردسـتان نـاچن «پەشێو»› ☰ ستارەشناس

**ئەستێرەناسی** / estêrenasî/: ناو. ئەستێرەشناسی؛ هەسارەناسی ☰ ستارەشناسی

**ئەسـتێرک** / estêřik/: نـاو. ١. ☜ **ئەسـتێر** ٢. هەرزاڵ؛ پێرک؛ سەکۆی لە گـڵ یـان لـە دار بـۆ کەڵوپەل لـە سـەر دانـان ☰ ١. ☜ **ئەستێر** ٢. تلیبار

**ئەسـتێڤک** / estêvik/: نـاو. کـەوگیر؛ دەفـری کون-کون بۆ پالاوتن ☰ کفگیر؛ سوزمە

**ئەستێلک** / estêlik/: ☜ **ئەستێر**

**ئەستێڵ** / estêł/: ☜ **ئەستێر**

**ئەستێڵک** / estêłik/: ☜ **ئەستێر**

**ـ ئەستێن** / -estên/: پاشەوشە. ـ سێن؛ ـ سان؛ ـگر؛ وەرگر ‹لێرەش لە نێـو دەریـای ڕقـی بـێ‌بەسـتێن/ لێرەش لە نێو کـوڕانی تۆڵـەئەسـتێن «هـێمن»› ☰ ـگیر؛ ـ ستان

**ئەسـتێندراو** / estênd(i)raw/: ناوەڵـناو. سـەنیاگ؛ ڤەگرتی ☰ گرفتە شدە

**ئەستێو** / estêw/: ناو. خاکەنازی ئاگر گوێزانەوە ☰ آتشگیر

**ئەستێ و بەرد** / estêwberd/: ناو. پارچـە ئاسـن و بەردێ کە ئاگری پێ دە پووشـوو بـەر دەدەن ☰ سنگ و فلز آتشزنە

**ئەستێ و پووشوو** / estêwpûşû/: ناو. *[کینایە]* کارد و

پەنیر؛ کتک و مشک؛ دژایەتی توند 🇮🇷 کارد و پنیر

**ئەستێور** / estêwir/: ناوەڵناو. ئەستەویر؛ ستێور؛ ستەور؛ قسر؛ باری لە زا وەستانی کاتیی 🇮🇷 سترون

**ئەستێوری** / estêw(i)rî/: ناو. نەزۆکی 🇮🇷 سترونی

**ئەستێولک** / estêwlik/: ناو. ئەستێولک؛ بستۆکە؛ پارچە ئاسنی سەر تەنوور 🇮🇷 سرپوش فلزی تنور

**ئەستێوڵک** / estêwiłk/: ناو. ئەستوێڵک؛ سەولک: ١. کۆڵەوژ؛ ئاسنێکە بۆ ئاگر تێکوەردان و کۆڵوو لە تەندوور دەرێنان ٢. بستۆکە؛ پارچە ئاسنی سەر تەنوور🇮🇷 ١. آهن تنور به هم زدن ٢. سرپوش فلزی تنور

**ئەسر** / esr/: ☜ **ئەسرین**

**ئەسرۆ** / esro/: ناو. سترھ؛ سترەھ؛ سترۆ؛ ستروو؛ ئسترۆ؛ ستر؛ قۆچ؛ شەقۆن؛ شاخی حەیوان 🇮🇷 شاخ

**ئەسرو** / esrû/: ناو. سەوڵ 🇮🇷 سرو

**ئەسریلک** / esrîlik/: ☜ **ئەستریلك**

**ئەسرین** / esrîn/: ناو. ئەسر؛ فرمێسک؛ ڕۆندک ‹ئەسرین جە دیدەم پەیاپەی مەشۆ/ چوون سەیل وەهار شەوان تا بە ڕۆ «بێسارانی»› 🇮🇷 اشک

**ئەسریناوی** / esrînawî/: ناوەڵناو. فرمێسکاوی؛ هەرسین 🇮🇷 اشک‌آلود

**ئەسرێلک** / esrêlik/: ☜ **ئەستریلك**

**ئەسفەناج** / esfenac/: ☜ **ئەسپەناخ**

**ئەسکام** / eskam/: ناوەڵناو. ساغ؛ سەلامەت 🇮🇷 تندرست

**ئەسکامی** / eskamî/: ناو. ساغی؛ سەلامەتی 🇮🇷 تندرستی

**ئەسکڵ** / eskił/: ناو. پۆل؛ پۆلوو؛ سکڵ؛ پەنگر؛ پەن؛ بژ؛ پەل؛ پەرەنگ؛ خەڵووزی سوورەوە بوو 🇮🇷 اخگر

**ئەسکنجە** / eskince/: ناو. جومگەی نێوان ڕان و سمت 🇮🇷 مفصل بین ران و لگن

**ئەسکوند** / eskund/: ناو. ١. بەرزی؛ بڵندی ‹لە ئەسکوند و چالایە هەڵدان و گێژی «سوارە»› ٢. سوڵتان؛ دۆخی ڕاوەستانی جگ لە سەر کەللە 🇮🇷 ١. بلندی ٢. حالتی در بازی با شتالنگ

**ئەسکوێ** / esk(i)wê/: ناو. ئەسکۆ؛ ئەسکوو؛ هسکوو؛ هەسک؛ هەسکوێ؛ هەسکۆ؛ هەسکە؛ کەوچکی قووڵی کلکدرێژ ‹خەستێکە ئەسکوێی تێ ناچێ «مەسەل»› 🇮🇷 ملاغه

⊡ **ئەسکوێ دە مەنجەڵ گێڕان**: *[کینایە]* ئاشکرا کردن و خستنە ڕووی ڕاز و نهێنی 🇮🇷 افشا کردن

**ئەسکوێی هەموو دیزان بوون**: *[پلار]* خۆ لە هەموو کارێک هەڵقوتاندن 🇮🇷 کاسەی هر آشی بودن

**ئەسکۆ** / esko/: ☜ **ئەسکوێ**

**ئەسکوو** / eskû/: ☜ **ئەسکوێ**

**ئەسکەر** / esker/: ناو. قەساو؛ قەساب؛ سەرژێکەرکەسێ کە حێوان سەر دەبڕێ 🇮🇷 سلّاخ

**ئەسکەلە** / eskele/: ناو. بەندەرگا؛ لەنگەرگا؛ ئاوەدانی قەراخی دەریا کە گەمیەی لێ ڕادەوەستێ 🇮🇷 بندرگاه

**ئەسکەمل** / eskemil/: ناو. ئەسکەملە: ١. سەندەڵی؛ کورسی لە سەر دانیشتن ٢. بەرزیلان؛ قوماری شێر و خەت 🇮🇷 ١. صندلی ٢. شیر و خط

**ئەسکەملە** / eskem(i)le/: ☜ **ئەسکەمل**

**ئەسکەملی** / eskem(i)lî/: ناو. ئەسکەمل؛ سەندەڵی؛ کورسی یەکنەفەرە 🇮🇷 صندلی

**ئەسکەناس** / eskenas/: ناو. ئەسکیناس؛ پووڵ و پارەی لە قاقەز 🇮🇷 اسکناس

**ئەسکەنجەبین** / eskencebîn/: ناو. ئەسکەنجەمین؛ شەربەتی سرکە و هەنگوین ‹... جەو ئەسکەنجەبین دەس سرشتەکەت/ یانێ نامەکەی زیبا و زشتەکەت ... «مەولەوی»› 🇮🇷 سکنجبین

**ئەسکەنجەمین** / eskencemîn/: ☜ **ئەسکەنجەبین**

**ئەسکەنە** / eskene/: نـاو. تیخـی نـەجاران؛ ئامرازێکی دارکۆلینی دارتاشانە 🇮🇷 اسکنە

**ئەسکیناس** / eskînas/: ☜ **ئەسکەناس**

**ئەسلەحە** / esleĥe/: ☜ **ئەسڵەحە**

**ئەسڵ**[1] / es(i)ł/: ئاوەڵناو. ١. ڕەسەن ‹ئەم نقێمە بەدەڵ نییە، ئەسڵە› ٢. نەجیب؛ بنیچە بەڕێز و گەورە ‹ئەسڵە، لە بنەماڵەیەکی بەناوبانگە› 🇮🇷 ١. اصل ٢. نجیب

**ئەسڵ**[2]: ئامراز. بۆ سەیرمانی نابەدڵ دەگوترێ ‹بە خوا بابە ئەسڵ! گاڵتەم پێ دەکا› 🇮🇷 نشانەی تعجب و بیزاری

**ئەسڵزادە** / es(i)łzade/: ئاوەڵناو. دایک و باب نەجیم؛ (فرزەندی) چاک و بنیچە باش 🇮🇷 نجیبزادە

**ئەسڵەحە** / esłeĥe/: ناو. ئەسلەحە؛ چەک؛ ئامرازی شەڕ و جەنگ 🇮🇷 اسلحە

**ئەسڵەن** / esłen/: ئاوەڵکار. ١. لە ڕاستیدا؛ لە بنەڕەتدا ٢. هەرگیز؛ بە هیچ جۆر 🇮🇷 ١. در اصل ٢. هرگز

**ئەسڵی** / esłî/: ئاوەڵناو. سەرەکی: ١. بنەڕەتی؛ بنچینەیی ‹ڕێگای ئەسڵی› ٢. ڕاستەقینە؛ ڕاستەقانێ ‹کاڵای ئەسڵی› 🇮🇷 ١و٢. اصلی

**ئەسمەر** / esmer/: ئاوەڵناو. گەنمی؛ سەوزە؛ ڕەشتاڵە؛ ڕەشئەسمەر؛ گەنم ڕەنگ؛ سپی و زەردی ئاماڵ ڕەش ‹دەما دل دی ب مەحبووبان/ ب شووخ و شەنگ و ئەسمەر دە «مەلای جزیری»› 🇮🇷 گندمگون

**ئەسمەرپێچ** / esmerpêç/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی تیغی چادری بە بەنی ڕەنگاوڕەنگ نەخشاو ‹چێخی ئەسمەرپێچ ڕەشماڵانی جاف/ ڕووپۆشی شێوەی شای مشکین کەلاف «شێخ سەلام»› 🇮🇷 چیغ

**ئەسور** / esûr/: ناو. سەوزەوات؛ سەوزی؛ سەبزی؛ ئەو گیایانەی بە کاڵی دەخورێن 🇮🇷 سبزیجات

**ئەسەر**[1] / eser/: ناو. شوێن؛ شوێنەوار ‹نالی ئەسەری بێئەسەری غایبە ئەمما/ نالەیکی حەزین دێ لە موناجاتی سەحەردا «نالی»› 🇮🇷 اثر

**ئەسەر**[2]: ئامراز. لە سەر؛ لە بان 🇮🇷 بر

**ئەسەمۆڵی** / esemołî/: ☜ **ئەستەمبوڵی**

**ئەسەی** / esey/: چاوگ. سەندن: ١. ستاندن؛ وەرگرتن ٢. سەنن؛ کڕین 🇮🇷 ١. ستاندن ٢. خریدن

**ئەسید** / esîd/: ناو. ترش 🇮🇷 اسید

**ئەسیر** / esîr/: ناو. دیل؛ گراو؛ ئێسیر؛ یەخسیر ‹ئەگەر بێ یادی زولف و چاوەکەت یەک لەحزە سابیر بم/ ئەسیری بەندی کافر، کوشتەیی بێدادی ساحیر بم «وەفایی»› . هەروەها: **ئەسیری** 🇮🇷 اسیر

**ئەشت** / eşt/: ناو. شت؛ چت 🇮🇷 چیز

**ئەشتانە** / eştane/: جێناو. نێ؛ ئەمانە؛ ئەم کەسانە 🇮🇷 اینها

**ئەشتەبا** / eşteba/: ☜ **ئاشتەبا**

**ئەشخاڵ** / eşxał/: ناو. ١. ئەخشاڵ؛ وردەی ناوماڵ ٢. ئەشغاڵ؛ شەخەڵ 🇮🇷 ١. خرتوپرت ٢. آشغال؛ زبالە

**ئەشخەڵ** / eşxeł/: ناو. دەوەن 🇮🇷 بوتە

**ئەشرەفی** / eşrefî/: ناو. ١. سوورەت شایی؛ سکە زێڕێکی بچووکە بۆ خشڵ دە کار دێ ‹هەرگا دیم هیلال ئەو ئەبرۆی سێوەنگ/ یە سیم ئەسرین، یە ئەشرەفی ڕەنگ «مەولەوی»› ٢. گوڵێکە لە گوڵباخ دەکا، بۆنی کەمتر و گوڵەکانی زەردن 🇮🇷 ١. اشرفی ٢. از گلها

**ئەشق** / eşq/: ☜ **عیشق**

**ئەشقەمە** / eşqeme/: ناو. ١. گەدە و گیپاڵ؛ ورگی ئاژەڵ بە ڕیخۆڵەوە ٢. *[پلار]* زگی زل 🇮🇷 ١و٢. شکمبە

**ئەشقی** / eşqî/: ☜ **ئەشقیا**

**ئەشقیا** / eşq(i)ya/: ئاوەڵناو. ئەشقی؛ یاخی؛

ملهوڕ؛ گوێنەدەر بە قانوون و ڕێ و شوێن ‹دڵ لەت دەبێ کە هەر دوو جگەرگۆشەی ئادەمن/ قابیلە ئەشقیایە، ئەبولئەنبیایە شەیس «مەحوی»› ▬ یاغی

**ئەشقییەتی** / eşqîyetî/: ناو. سەربزێوی ▬ طُغیانگری

**ئەشک** / eşk/: ناو. ١. فرمێسک؛ ڕۆندک؛ ئەسرین ‹ئەشکم کە دەگەڵ عەشقمە، تفلێکی فەهیمە/ هۆشم کە دەگەڵ خۆشمە، پیرێکی نەزانە «نالی»› ٢. ☜ عیشق ▬ ١. اشک ٢. ☜ عیشق

**ئەشکاڵ** / eşkal/: ناو. هەمەڕەنگە؛ هەموو جۆرە ‹ماشەڵا دووکانەکەت ئەشکالی تێدایە› ▬ از همه رقم

**ئەشکاوای** / eşkaway/: چاوگ. ئەشکاوتەی؛ کەلاشتن؛ قەڵشاندن ▬ شکافتن

**ئەشکاوتەی** / eşkawtey/: ☜ ئەشکاوای

**ئەشکاویەی** / eşkawyey/: چاوگ. قەڵشان؛ تلیشیان ▬ شکافته شدن

**ئەشکنج** / eşkinc/: ناو. ئەسکنجە؛ جووجکە سمت؛ بەندی نێوان ڕان و سمت ▬ مفصل بین ران و لگن

**ئەشکنجە** / eşkince/: ناو. ١. جەڕ و مەنگەنە؛ ماوش؛ ئەشکەڵە ٢. گیرەی دارتاش و ئاسنگەران بۆ قایم ڕاگرتنی تەختە یا ئاسن لە برین و بربەند لێداندا ٣. جەزرەبە؛ ئازار و جزیا ▬ ١و٢. منگنه ٣. شکنجه

**ئەشکۆڵ** / eşkoł/: ناو. کلۆم؛ داری پشت دەرگا بۆ داخستن ▬ کلون

**ئەشکەرە** / eşkere/: ناو.ئاو. خویا؛ ئاشکرا؛ دیار ▬ آشکار

**ئەشکەفت** / eşkeft/: ☜ ئەشکەوت

**ئەشکەفک** / eşkefik/: ناو. ١. شکەفک؛ تەبەکی دارین بۆ هەویر و سەبزی و ... ٢. ☜ ئەشکەو ▬ ١. طبق چوبین ٢. ☜ ئەشکەو

**ئەشکەڵە** / eşkełe/: ناو. ١. مەنگەنەی نەجاڕ و ئاسنگەر ٢. دارۆکێکی لەلەکراو بۆ پێکەوە لێکدانی تەختە دەوار ٣. چێوجەلە؛ ئامرازێکی جەزرەبە دان بووە هەر قامکەی تاوانباریان دە ناو کونە تەختەیەکی خڕ دەنا و بە پەت جەڕەبابەیان دەدا ▬ ١. منگنه ٢. چوبک به هم بستن چادر ٣. از وسایل شکنجه

**ئەشکەنجە** / eşkence/: ناو. ئشکەنجە؛ ئازار؛ جەزرەبە ‹لە ئەشکەنجەی شکەنجی زولفی ئەو بێوەعدە مورغی دڵ/ دەناڵێنێ وەکوو بولبول لە سوبحی کازیبی شەودا «نالی»› ▬ شکنجه

**ئەشکەنە** / eşkene/: ناو. کارواناشی؛ گۆشتاوێکی خەست و خۆڵ بە کەشک و پیوازەوە ▬ اشکنه

**ئەشکەو** / eşkew/: ناو. ئەشکەفک؛ شکەو؛ دەفری سواڵەت ▬ ظرف سُفالین

**ئەشکەوت** / eşkewt/: ناو. ئەشکەفت؛ ئشکەفت؛ شکەفت؛ نوا؛ زاخۆر؛ زایەند؛ غار؛ خار؛ مەڕ؛ مەڕە؛ مغار؛ مغارە؛ مەغار؛ مەغارە؛ مەخرا؛ کاو؛ کاف؛ کەڵما؛ کەلوەز؛ کافک؛ کوڤ؛ قەف؛ کەوەر؛ کەوور؛ کەووڕ؛ کەوڕک؛ کەورگ؛ کەوەرگ؛ کوونرەخ؛ کومزەخ؛ کووڵ؛ قەوارت؛ وەرما؛ زڤنگ؛ هوولولیف؛ غولۆلیف؛ خوولولیف؛ تون؛ زلان؛ هلۆڵ و ڕەهۆڵی سروشتی لە کێودا ‹من پەروەردەی بن سێبەری ئەشکەوتم/ گەلێک جاران لە چالاوی ڕەش کەوتم «هێمن»› ▬ غار

**ئەشکەولەت** / eşkewlet/: ناو. شکەولەت؛ کاسەکەل؛ بنە دیزە و گۆزەی شکاو کە بە یەکجاری لە کار نەبووە ▬ کوزەشکسته

**ئەشکیلۆک** / eşkîlok/: ناو. تێکولی گوێز ▬ پوستەی گردو

**ئەشکێل** / eşkêl/: ناو. ١. ئشکێل؛ چوارمێخە؛ چوارنیخە؛ کار و ڕەوتی چواریەل بەستن و بە زەویدا دان ٢. سندم؛ پێوەند؛ زنجیر و ئاڵقەی

دەیکەنە پای بەندی و یەکسم ≡ ١. چهارمیخه ٢. پابند آهنی

**ئەشمەک / eşmek/**: ناو. شمەک؛ ئەسپاو؛ کەلوپەل ≡ اسباب

**ئەشناسای / eşnasay/**: چاوگ. ناسین ≡ شناختن

**ئەشناسیای / eşnasyay/**: چاوگ. ناسران ≡ شناخته شدن

**ئەشنە / eşne/**: ناو. بلچ؛ گوێژ ≡ زالزالک

**ئەشەدبۆ / eşedbo/**: ناو. گیایەکی دەرمانی و بۆنخۆشە، بۆنەکەی پشیلە بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت، گوڵەکانی سپی و ئاڵ و هێشوویین، ڕەگ و بنکەکەی تایبەتمەندی ئارامبەخشی، دژەکۆلنج، دژیکرمی ناوسک و ژانەسەرە ≡ سنبل‌الطیب طبی؛ علف گربه‌ی طبی؛ والریانه

**ئەشەدو / eşedû/**: ☜ **ئەشەدوبیلا**

**ئەشەدوبیلا / eşedûbîla/**: سارستە. ئەشەدوو؛ خوا گەواهە ≡ اشهدُبالله

**ئەشیا / eşya/**: ناوەلکار. ئەشیای؛ ئەشیایێ؛ دەبوو؛ دەبوا ≡ می‌بایست

**ئەشیان / eşyan/**: چاوگ. ئەشیای؛ شیان: ١. شیاو بوون ٢. پێویست بوون ≡ ١. شایستن ٢. بایستن

**ئەشیای[1] / eşyay/**: ☜ **ئەشیان**

**ئەشیای[2]**: ☜ **ئەشیا**

**ئەشیایێ / eşyayê/**: ☜ **ئەشیا**

**ئەشێ / eşê/**: ناوەلکار. دەشێ: ١. شیاوە؛ جێی خۆیە ٢. دەبێ؛ پێویستە ≡ ١. شایسته است ٢. باید

**ئەعیان / e'yan/**: ناو. دەوڵەمەند؛ دەسمایەدار ‹لاژوورنشینی دەستەی ئەعیان بووم/ زۆر خۆشەویستی کۆڕی یاران بووم «قانع»› ≡ اعیان

**ئەغز / eğz/**: ناو. زوڵم؛ ناهەقی؛ دەسدرێژی ≡ ستم

**ئەغزە / eğze/**: ☜ **ناغزە**

**ئەغلەب / eğłeb/**: ناوەلکار. زۆربە؛ زۆرتری؛ پرایی؛ زۆرینە ≡ اغلب

**ئەغیار / eğyar/**: ناوەلناو. ١. وریا؛ بەهۆش ٢. بێگانە؛ بیانی؛ غەوارە ‹ئاخر پەی ئەغیار جە من ویەردی؟!/ ئای بێ بەلا بی! ئانە چێش کەردی؟ «مەولەوی»› ≡ ١. هُشیار ٢. بیگانه

**ئەفتاوگەردان / eftawgerdan/**: ناو. بەرچاوە؛ پەڕۆیەک دروێنەوان بە سەر تەوێڵیەوە دەبەستن ≡ پیشانی‌بند دروگران

**ئەفتاوە / eftawe/**: ناو. هەفتۆوە؛ لوولێنە ≡ آفتابه

**ئەفتەو / eftew/**: ☜ **ئافتاو**

**ئەفچک / efçik/**: ناو. جیق؛ هەناو ≡ احشاء

**ئەفچکاندن / efç(i)kandin/**: چاوگ. فلیقاندن؛ جیق دەرهێنان ≡ له کردن

**ئەفچکین / efç(i)kîn/**: چاوگ. جیق دەرهاتن؛ فلیقان ≡ له شدن

**ئەفرۆز / efroz/**: ناو. ڕەوتی دابەزین؛ کەم کردن ≡ اُفت

**ئەفسانە / efsane/**: ناو. ١. دیرۆک؛ خربرۆشک؛ خەبەرۆشک؛ دەرەڤۆک؛ قەواتی؛ شتێ کە نەبووە و بە خەیاڵ دروست کراوە ٢. *[کنایە]* چیڤانۆک؛ ڕووداوێکی ناڕاست کە نەکراوە و ناکرێ ≡ ١. افسانه ٢. قصه

**ئەفسانەیی / efsaneyî/**: ناو. خەیاڵی: ١. بە بارودۆخی دیرۆکی و خەیاڵییەوە ‹پاڵەوانی ئەفسانەیی› ٢. *[کنایە]* هەژەند؛ سەیر و سەمەرە و نائاسایی ‹کۆشکی ئەفسانەیی› ≡ ١. افسانه‌ای ٢. خیالی

**ئەفسۆس / efsos/**: ناو. حەسرەت؛ عەزرەت ≡ حسرت

**ئەفسوون / efsûn/**: ناو. جادوو؛ سیحر ‹بە ئەفسوون و دوعا تەسخیری ئەو شۆخە چ ئیمکانە/ خەیاڵی خاوە، عەنقا ناکەوێتە داوی ئەفسانە «مەحوی»› ≡

افسون

**ئەفسوناوی** / efsûnawî/: ئاوەڵناو. سیحراوی ≡ سحرآمیز

**ئەفسونکار** / efsûnkar/: ناو. جادووگەر ≡ جادوگر

**ئەفسونکاری** / efsûnkarî/: ناو. جادووگەری ≡ جادوگری

**ئەفسونگەر** / efsûnger/: ناو. جادووگەر؛ سیحرباز ≡ افسونگر

**ئەفسەر** / efser/: ناو. پلەمەند؛ دەرەجەیەک لە ئەرتەش ≡ افسر

**ئەفەندی** / efendî/: ناو. ئاغا؛ ئاغە ‹تاوێ شێخی خانەقام و تاوێ جەردەی سەرملان/ تاوێ ئەمبینێ ئەفەندیم، عەتر و سابوونم هەیە «قانع»› ≡ افندی

**ئەڤ** / ev/: جێناو. ئەو؛ هەو ≡ او

**ئەڤان** / evan/: جێناو. ئەوان ≡ آنها

**ئەڤاندن** / evandin/: چاوگ. هەژی کرن؛ حەز لێ کردن ≡ دوست داشتن

**ئەڤانە** / evane/: ☜ ئەمانە

**ئەڤدال** / evdal/: ناو. ئەبدال؛ نێرەپۆڕ ≡ دُرّاج نر

**ئەڤداڵگەڕ** / evdałgeř/: ئاوەڵناو. شڕۆڵی چلکن ≡ ژولیدەی کثیف

**ئەڤدەر** / evder/: ئاوەڵکار. ئێرە؛ ئەیرە؛ ڤێدەرێ ≡ اینجا

**ئەڤدین** / evdîn/: ناو. تۆلە؛ تۆڵ؛ هەیف ‹ئەڤدینا خوە ستاندن› ≡ انتقام

**ئەڤرا** / evra/: ئاوەڵناو. بەرز؛ بلند؛ بلیند ≡ بُلند

**ئەڤراز** / evraz/: ناو. هەوراز؛ بلندایی؛ بەرزایی ≡ بُلندی

**ئەڤرازی** / evrazî/: ناو. سەرفەرازی؛ سەربەرزی ≡ سربُلندی

**ئەڤراندن** / evrandn/: چاوگ. ئافراندن؛ وەدیهێنان؛ دروست کردن ≡ آفریدن

**ئەڤرۆ** / evřo/: ☜ ئەمرۆ

**ئەڤشی**[1] / evşî/: ناو. دەورە و دیواری ئاژەڵ تێدا ڕاگرتن ≡ محوطەی نگهداری دام

**ئەڤشی**[2]: ئاوەڵناو. لە شیر وەستاو؛ وشکبوو ‹بزنێت مە هەژ بهاریڤە ئەڤشین› ≡ از شیردهی ایستاده

**ئەڤشین** / evşîn/: ناو. ١. کاری ڕاگرتن؛ هێشتنەوە ٢. ئاژەڵی لە شیردان وەستاو ≡ ١. نگهداری ٢. دام از شیر ایستاده

**ئەڤقا** / evqa/: ئاوەڵکار. ئەوەندە؛ ئەونە؛ هێندە ≡ اینقدر

**ئەڤک** / evik/: ناو. میتکە؛ قیتکە؛ بەلۆکە ≡ چوچوله

**ئەڤکینگ** / evkîng/: ناو. ئەو ئاردە کە پێش پان کردنەوە بە ئەنگوچکە هەویریدا دەکەن ≡ آردی که بر چونه می‌پاشند

**ئەڤۆر** / evor/: ناو. ئاڤور؛ نێرییە کێوی ≡ بُز کوهی نر

**ئەڤە** / eve/: ☜ ئەوە

**ئەڤەندە** / evende/: ☜ ئەوەندە

**ئەڤهێندە** / evhênde/: ☜ ئەوەندە

**ئەڤین** / evîn/: ناو. ئەوین؛ دلداری؛ عیشق؛ خۆشەویستی ≡ عشق

**ئەڤینپەروەر** / evînperwer/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی کەسێ کە ئەوینی لا پیرۆزە ≡ عشق‌گرا

**ئەڤینچریک** / evinc(i)rîk/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی کەسێ کە بایەخێ بە ئەوین نادا ≡ عشق‌گُریز

**ئەڤیندار**[1] / evîndar/: ناو. ئەویندار؛ عاشق؛ دلدار؛ هۆگر و دلبەستەی یەکجار زۆر بە شتێ یان کەسێ ‹کێ ئەڤیندارە بێ‌کەس‌وکارە› ≡ عاشق

**ئەڤیندار**[2]: ئاوەڵناو. ئەویندار؛ عاشق؛ دلدار؛ بە هۆگری و دلبەستەیی زۆرەوە بە کەسێ یا شتێ ‹ئەڤینداری سروشتی کوردەواریم› ≡ عاشق

**ئەڤینداری** / evîndarî/: ناو. هەڤینداری؛ دلداری؛ ئەوینداری ≡ عاشقی

**ئەڤینڤان** / evînvan/: ناو. ئەویندار؛ عاشق ☰ عاشق

**ئەڤینی** / evînî/: ناو. ئەوینی؛ دلداری؛ عیشق ☰ عشق

**ئەڤێرێ** / evêrê/: ☜ ئائێره

**ئەقاقی** / eqaqî/: ☜ ناقاقیا

**ئەقرەوە** / eqrewe/: ☜ قەرەبوو

**ئەقرەوی** / eqrewî/: ☜ قەرەبوو

**ئەقڵ** / eq(i)ł/: ناو. عەقڵ؛ فام ‹هەر ئەقڵێ لە خەسارێ «مەسەل»› ☰ عقل

▣ **ئەقڵ برین:** نۆک تێ هاوردن؛ قسە لە برشت خستن ☰ حرف را از قاطعیت انداختن

**ئەقڵدار** / eq(i)łdar/: ناوەڵناو. عاقڵ؛ ئاقڵ؛ ژیر؛ فامیدە؛ بەئاوەز؛ خاوەن عەقڵ ☰ عاقل

**ئەقڵسووک** / eqłsûk/: ناوەڵناو. *[مەجاز]* بێ‌عەقڵ؛ هش‌سڤک؛ کەم‌فام؛ هەقمەق ☰ سبُک‌مغز

**ئەقڵمەند** / eqłmend/: ناوەڵناو. خاوەن ئاوەز ‹ژنێکی زۆر عەقلمەند و ژیرە› ☰ فهمیده

**ئەقەرە** / eqere/: ☜ ئەوەندە

**ئەقیق** / eqîq/: ☜ ناقیق

**ئەک** / ek/: دەنگ. دەک؛ هەک؛ حەک؛ وشەی پەسند کردن یان داخ خواردن و پێ ناخۆش بوون ‹ئەک، لەو دوورە پێکای! ئەک، مالت بە قوڕ گیرێ!› ☰ وه

**ئەکاکی** / ekakî/: ☜ ناقاقیا

**ئەکتەر** / ekter/: ناو. نیارڤان؛ شانۆگەر ☰ بازیگر

**ئەککوو** / ekkû/: دەنگ. پەککوو؛ وشەی سەرسووڕمان ☰ واه

**ئەکێ** / ekê/: جێناو. کێ؛ چ کەسێ ☰ کی

**ئەگاڵ** / egał/: ☜ عەگاڵ

**ئەگرە**[1] / egre/: ناوەڵکار. ئێرە؛ ئەیرە؛ ڤر ‹ئەگرە ئاو قتە› ☰ اینجا

**ئەگرە**[2]: جێناو. ئێرە؛ ئەیرە؛ ڤر ‹ئەگرە کامیارانە› ☰ اینجا

**ئەگریجە** / egrîce/: ناو. بسک؛ مووی بە سەر لاجانگدا هاتوو ‹گیسووت بەرەزای پەخش پای کاوان/ زوڵفت ئەگریجەی باڵ بەت ئاوان «وەلی دیوانه»› ☰ زُلف

▣ **ئەگریجە برین:** ئەتک کردنی ژن لە سەر تاوان ☰ گیسو بریدن

**ئەگریجە برینەوە:** ئەگریجە قەیچی کردن بۆ جوان نیشاندان ☰ زلف پیراستن

**ئەگریمۆنێ** / egrîmonî/: ناو. گیاجگەر؛ گیایەکی دڕکاوییە ☰ گیاهی خاردار

**ئەگوەر** / egwer/: ناوەڵناو. گەورە؛ مەزن ☰ بزرگ

**ئەگە** / ege/: ناو. ئەگەر؛ ئەیەر ☰ اگر

**ئەگەر**[1] / eger/: ناو. ئەیەر؛ وێچوویی؛ گاهەسێ؛ ڕێ‌تێ‌چوویی ‹دەبێ بتوانین رووبەڕووی هەر ئەگەرێک ببینەوە› ☰ احتمال

▣ **ئەگەر تێهێنان:** نۆک تێ هاوردن؛ قسە لە برشت خستن ☰ حرف را از قاطعیت انداختن

**ئەگەر هەبوون:** وێچوون؛ ڕێ تێ چوون ☰ احتمال داشتن

**ئەگەر**[2]: ئامراز. ئەر؛ گەر؛ ئەیەر؛ وشەی مەرج ‹تۆ ئەگەر هەستی لە جێ ڕاوەستی، دێو و کافریش/ دێن دەڵێن بەخودا قیامەت ڕاستە، هەستانی هەیە «نالی»› ☰ اگر كه

**ئەگەرچی** / egerçî/: ئامراز. هەرچەندە؛ لەگەڵ ئەوەشا ‹ئەگەرچی شەو درەنگە، ساقی بۆم تێکە کەمێکی تر/ کە وا دیسان لە ناخمدا سەری هەڵدا خەمێکی تر «هێمن»› ☰ هرچند؛ گرچه

**ئەگەرخۆ** / egerxo/: ئامراز. ئەگەرچی؛ هەرچەند ‹خەندە و دەمی مەحبووبە کە وا زۆر نمەکینن/ بەس خۆشە ئەگەرخۆ نمەکی زەخم و برینن «نالی»› ☰ اگرچه

**ئەگەرکوو**[1] / egerkû/: ناوەڵکار. ئەگەرێکوو؛

گریمان؛ با وای دانێین ☰ فرضاً

**ئەگەرکوو**[٢]: ئامراز. ئەگەرێکوو؛ هاتوو؛ بێتوو؛ ئەگەر ☰ اگر

**ئەگەرمەگەر** / egermeger/: ناو. ئەگەر و نەگەر؛ دووبەختەکی ‹هاتنیان لە ئەگەرمەگەردایە› ☰ باید و شاید

**ئەگەرمەگەری** / egermegerî/: ئاوەڵناو. ناڕوون و لە هات و نەهاتدا ‹هێرشی ئەگەرمەگەری› ☰ احتمالی

**ئەگەرنا** / egerna/: ☜ ئەگەرنە

**ئەگەرنە** / egerne/: ئامراز. ئەگەرنا؛ ئەگینا؛ دەنا ☰ ارنه؛ ورنه

**ئەگەری** / egerî/: ئاوەڵناو. شیمانە؛ گاهەزی ☰ احتمالی

**ئەگەریش** / egerîş/: ئامراز. خۆ ئەگەر ☰ اگرکه؛ اگر هم

**ئەگەرێکوو** / egerêkû/: ☜ ئەگەرکوو

**ئەگیت** / egît/: ئاوەڵناو. ئەگید؛ ئازا؛ جامێر؛ مێرخاس ☰ جوانمرد

**ئەگیتی** / egîtî/: ناو. مێرخاسی؛ ئازایەتی ☰ جوانمردی

**ئەگید** / egîd/: ☜ ئەگیت

**ئەگین** / egîn/: ئاوەڵکار. ئەگینا؛ دەنا؛ وەئیللا ☰ وگرنه

**ئەگینا** / egîna/: ☜ ئەگین

**ئەڵئان**[١] / el'an/: ناو. ئێستە؛ ئێستا؛ ئەلحان؛ ئەلعان؛ ئەم دەمە ‹ئەڵئان تا بەیانی زۆری ماوە› ☰ اکنون

**ئەڵئان**[٢]: ئاوەڵکار. هەر ئێستە؛ ئیستەکێ؛ ئایسە ‹ئەڵئان دێمە لاتان› ☰ اکنون

**ئەلا** / ela/: دەنگ. ئەرێهۆ؛ ئەرێ؛ هەرێ؛ هۆ؛ ئەهەی؛ ئەرە؛ ئانە؛ وشەی بانگ کردن و سەرنج ڕاکێشان ‹ئەلا ئەی ئاسکی ناسک! بە باسک/ شکاندت گەردنی سەد شێری شەرزە «نالی»› ☰ هان؛ ای

**ئەلاجوقە** / elacûqe/: ناو. هەقلیمەقۆ؛ داردوولک ☰ الکدولک

**ئەلاحیدە** / elaĥîde/: ئاوەڵناو. عەلاحیدە؛ تایبەتی؛ جیاواز ☰ ویژه

**ئەلاف** / elaf/: ئاوەڵناو. عەلاف؛ سەرگەردان ☰ علاّف

**ئەلان** / elan/: ناو. ئەڵئان؛ ئێستە؛ ئەلحان ☰ الآن

**ئەلبەکی** / elbekî/: ناو. دیزە؛ قازان؛ مەنجەڵ ☰ دیگ

**ئەلپ** / elp/: ناو. سەتڵی ئاو ☰ سطل آب

**ئەلپەشک** / elpeşik/: ناو. بەردی پاشۆر ☰ سنگ‌پا

**ئەلحان** / elĥan/: ☜ ئەڵئان

**ئەلحەد** / elĥed/: ناو. گۆڕیچە؛ ئەلحەد؛ جێگەی مردوو لە بنی گۆڕدا ‹قەبرم هەڵکەنن ئەلحەدم خەیلێ/ کفنم ببڕن بە بالای لەیلێ «فولکلۆر»› ☰ لحد

**ئەلحەمد** / elĥemd/: ناو. فاتیحە؛ فاتحە ☰ فاتحه

**ئەلعان** / el'an/: ☜ ئەڵئان

**ئەلف** / el(i)f/: ناو. ناوی پیتی دووهەمی ئەلفوبێی زمانی کوردی ☰ الف

⊡ **ئەلف لە بێ نەکردنەوە**: /پلار/ کەر و گا لە یەک جیا نەکردنەوە؛ هیچ نەفامین ☰ هِر از بِر نشناختن

**ئەلفوبێ** / elf û bê/: ☜ ئەلفوبێتکە

**ئەلفوبێتکە** / elf û bêtke/: ناو. ئەلفوبێ؛ پیتی خوێندن و نووسین ☰ الفبا

**ئەلفە** / elfe/: ناو. پێوەند؛ ئەشکێل ☰ پای‌بند آهنین

**ئەلکول** / elkul/: ناو. ناوی گشتی بۆ تاقمێک تراوی کیمیاوییە کە ئاور دەگرن و بۆنێکی تایبەتی و تامێکی توندیان هەیە و لە بژیشکی و پیشەسازیدا زۆر بە کار دەچن ☰ الکل

**ئەلگمەلگ** / eligmelig/: ناو. هەلووکێن؛ هەلووکان 🇮🇷 الکدولک

**ئەللیرەم** / ellîrem/: ناو. ئەلیرم؛ کێشانەیەکە بەرانبەر بە ٤٥٠ گرەم 🇮🇷 وزنی معادل ۴۵۰ گرم

**ئەلمۆدە**[1] / elmode/: ناو. ژنە ئورووپایی ‹مێخەک بەند ئەخشێ لە ناو مەمکانی/ هەزار ئەلمۆدە بێ بە قوربانی «فولکلۆر»› 🇮🇷 آلامُد

**ئەلمۆدە**[2]: ئاوەڵناو. بەرامبەر بە داب و دەستوور و شێوە پۆشینی ئورووپایی ‹کەوشی ئەلمۆدە› 🇮🇷 آلامُد

**ئەلنگ** / eling/: ناو. گەلالووچ؛ زانک؛ زمانە چکۆلە 🇮🇷 زبان کوچک

**ئەلنگە** / elinge/: ناو. زانک؛ زوانە چکۆلە 🇮🇷 زبان کوچک

**ئەلوە** / elwe/: ☜ هەلۆ

**ئەلوەدا** / elweda/: ناو. مالاوایی؛ خواحافیزی ‹ئازیز! دیارەن، وادەی لوامەن/ ئەلوەدای ئاخر ئەوەنامامەن «مەولەوی»› 🇮🇷 خداحافظی

**ئەلوە** / elwih/: ☜ هەلۆ

**ئەلۆ** / elo/: ناو. پەرسڤی تەلەفوونی؛ پێش وتە لە تەلەیفۆندا، بە مانای سەلام 🇮🇷 الو

**ئەلۆر** / elor/: ئاوەڵناو. بە فاڵ؛ بە با؛ نێرخواز 🇮🇷 گُشن

**ئەلۆک** / elok/: ناو. عەلەشیش؛ قەلەموون؛ بۆقلە؛ بەقلە 🇮🇷 بوقلمون

**ئەلو** / elû/: ☜ هەلۆ

**ئەلە** / ele/: ناو. ١. هێلەک؛ ئاردبێژ ٢. ☜ هەلۆ 🇮🇷 ١. الک ٢. ☜ هەلۆ

**ئەلەرگ** / elerg/: ناو. لەگلەگ؛ لەقلەق؛ حاجیلەقلەق 🇮🇷 لکلک

**ئەلەفە** / elefe/: ناو. ١. قولفەی خێوەت ٢. دەسە؛ دەستەی گوریس ٣. کاری پێوەن کردنی دەست و پێی ولاخ بۆ وێرغە بوون 🇮🇷 ١. حلقەی چادر ٢. دستەی طناب ٣. عمل پابند کردن چهارپا

⊡ **ئەلەفە کردن**: ١. دەستە کردن (بۆ گوریس) ٢. پێوەند کردن (بۆ ولاخ) 🇮🇷 ١. دستە کردن (طناب) ٢. پابند کردن (چهارپا)

**ئەلەند** / elend/: ناو. تیشکی خۆر؛ پرشنگی هەتاو 🇮🇷 نور خورشید

**ئەلەنگە** / elenge/: ناو. زمانە چکۆلە؛ پارچە گۆشتێکی بچووکە لە بنی زمان و سەرەتای گەروودا 🇮🇷 زبان کوچک

**ئەلها** / elha/: ناو. ئەلیا: ١. خولیا؛ قرم؛ خیتک؛ حەز؛ واز ٢. تاسە؛ ئارەزوو؛ ئیشتیا 🇮🇷 ١. هوس ٢. آرزو

**ئەلهاکەر** / elhaker/: ناو. تامەزرۆ 🇮🇷 آرزمند

**ئەلهۆ** / elho/: ☜ هەلۆ

**ئەلیا** / elya/: ☜ ئەلها

**ئەلیرم** / elîrim/: ☜ ئەللیرەم

**ئەلیز** / alîz/: ☜ ئالیز

**ئەلیشیش** / elîşîş/: ☜ عەلەشیش

**ئەلیڤالی** / elîvalî/: ☜ بلالوک

**ئەلێ** / elê/: ☜ ئەمما

**ئەڵ ـ** / -eł-/: ☜ هەڵ ـ[3]

**ئەڵابەختەکی** / ełabextekî/: ئاوەڵکار. خواوڕاسان؛ خوابەختەکی؛ بە هەڵکەوت 🇮🇷 شانسی

**ئەڵاجەوی** / ełacewî/: ئاوەڵناو. بەلاجەوی؛ سەیر؛ عەجیب ‹فرە ئەلاجەوی بی ئەڕایان و سەریان سڕ منیاد› 🇮🇷 عجیب

**ئەڵاژیاگ** / ełajyag/: ئاوەڵکار. هەلاژیاو؛ ڕاکشاو؛ خۆ درێژ کردوو 🇮🇷 دراز کشیده

**ئەڵاژیان** / ełajyan/: چاوگ. ڕاکشان؛ ڕازان؛ پاڵ کەفتن؛ درێژەوە بوون 🇮🇷 دراز کشیدن

**ئەڵامەت**[1] / ełamet/: ☜ هەڵامەت

**ئەڵامەت**[2]: ئاوەڵناو. سەیر؛ سەیروسەمەرە ‹شتێکی ئەلامەتە بۆتە نسیبم!› 🇮🇷 عجیب و غریب

**ئەلاوەیسی** / elaweysî/: ناو. مەقامێکی کۆنی مووسیقای کوردییە 🇮🇷 نغمەی الهویسی

**ئەڵبەت** / elbet/: ئاوەڵکار. هەڵبەت؛ بێ‌گومان؛ ئەڵبەتە ‹بەڵێ بابی وەها ئەڵبەت دەبێ فەرزەندی وا بێنێ/ ئیلاهی سەد هەزار ڕەحمەت لە قەبری والید و مەولوود «شێخ ڕەزا»› 🇮🇷 البتە

**ئەڵبەتە** / elbete/: ☜ ئەڵبەت

**ئەڵپەڕ** / elpeř/: ئاوەڵناو. دووڕوو؛ ڕیاکار؛ دووزمان 🇮🇷 ریاکار

**ئەڵچاخ** / elçax/: ☜ ئاڵچاغ

**ئەڵچاغ** / elçağ/: ☜ ئاڵچاغ

**ئەڵحەد** / elĥed/: ☜ ئەلحەد

**ئەڵشکیان** / elşikyan/: چاوگ. تێشکیان؛ نابووت بوون؛ دارایی دۆڕان 🇮🇷 ورشکست شدن

**ئەڵقاوێز** / elqawêz/: ئاوەڵناو. بە پەت هەڵاوەسراو 🇮🇷 حلق‌آویز

**ئەڵقە** / elqe/: ☜ ئاڵقە

**ئەڵقەڕێز** / elqeřêz/: ☜ ئاڵقەڕێز

**ئەڵقەزوومە** / elqezûme/: ناو. ئاقزوونک 🇮🇷 سگک

**ئەڵماس** / elmas/: ناو. هەڵماس؛ کانزایەکی ڕوون، زۆر سەخت و بەنرخە ‹دووریت چوون ئەڵماس نیشتەن نە جەرگم/ ها وەختەن بەیۆ وادەکەی مەرگم «مەولەوی»› 🇮🇷 الماس

**ئەڵماسە** / elmase/: ناو. خووسار؛ زوقم 🇮🇷 سرماریزه؛ یَز

**ئەڵوات** / elwat/: ئاوەڵناو. ١. بێ‌شەرم؛ بەدفەڕ و هەرزە ٢. سەرسەری؛ ماڵ بە فیڕۆدەر و دەستبڵاو 🇮🇷 ١. لات ٢. سرسری

**ئەڵوەدا** / elweda/: ☜ هەڵوەدا

**ئەڵۆ** / elo/: ☜ هەڵۆ

**ئەڵۆجەڵۆ** / eloceło/: ئاوەڵناو. خوڕیوتوڕی؛ لاتولووت؛ گەجەرگوجەر؛ خەڵکی بێ‌سەروپا 🇮🇷 رجاله

**ئەڵووجە** / elûce/: ☜ هەڵووژە

**ئەڵووژە** / elûje/: ☜ هەڵووژە

**ئەڵەک** / elek/: ☜ ئێڵەک

**ئەڵەموت** / elemût/: ☜ هەڵەموت

**ئەڵەند** / elend/: ناو. کازێوە؛ ڕووناکی بەرەبەیان 🇮🇷 سپیده

**ئەڵێی** / elêy/: ئاوەڵکار. دەڵێی؛ ئێژی؛ ماچی؛ ئەیژی؛ گوایە؛ گوایا؛ چما؛ چمان؛ چماز ‹وەکوو تەیرێ هەڵۆ لێی دا، کز و خەڵتانی ناو خاکم/ بەبێ هۆشی ئەسووڕێمۆ، ئەڵێی سەرگێژەی تریاکم «قانع»› 🇮🇷 گویی؛ انگار

**ئەم**[1] / em/: ئاوەڵناو. ئەیە؛ ئی؛ ئەی ‹ئەم گۆزە وەکوو من بووە: دلدار و هەژار/ جارێکی دڵی خۆش بووە، سەد جار غەمبار «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› 🇮🇷 این

**ئەم**[2]: جێناو. ١. ئەڤ؛ ئەو؛ هێما بۆ نزیک ‹بۆ دەبێ زیندین لە زیندانم بکا؟ چونکە گوتم:/ ئەز مەمم، خەستەی خەمم، کوشتەی ئەمم، زینم دەوێ «هێمن»› ٢. ئێمە؛ ئەمە ‹گەر باعیسی ئەم دەپرسی کامە/ شەرتێکە کە بۆ هەموو تەمامە ... «حاجی قادر»› 🇮🇷 ١. او؛ ایشان ٢. ما

**ئەم**-[3]: پێشگر. ئیم ـ ئم ـ ئەڤ ـ ئا ـ ئی ـ ئەمە ‹ئەمساڵ؛ ئەمڕۆ› 🇮🇷 ام ـ

**ئەما** / ema/: ئامراز. بەلام؛ بەڵان 🇮🇷 اما

**ئەمار** / emar/: ☜ هەمار

**ئەماراو** / emaraw/: ☜ هەماراو

**ئەماس** / emas/: ئاوەڵناو. مەییو؛ بەسراو؛ مەیی 🇮🇷 مُنعقد

**ئەمان**[1] / eman/: ناو. ١. پەنا ‹ئاو بێ‌ئەمانە› ٢. فرسەت؛ دەرفەت؛ مۆڵەت 🇮🇷 ١. پناه ٢. فُرصت

⊡ **ئەمان (لێ)بڕین:** تەنگ پێ‌هەڵچنین؛ وەڕەز کردن 🇮🇷 بیزار کردن

**ئەمان نەدان:** پەنا پێ‌نەدان؛ دەرفەت نەدان؛

بڕست و دەرفەت لێسەندن ☰ امان ندادن

**ئەمان**[٢]: ئاوەڵناو. بێمەترسی ‹وڵات ئەمانە بۆ دز و درۆزن!› ☰ امن

**ئەمان**[٣]: جێناو. بۆ سێهەم کەسی کۆ ‹ئەوان چوون و ئەمان دێن› ☰ ایشان

**ئەمان**[٤]: ئامراز. بەڵام؛ وەلێ ‹ئەوم خۆش گەرەکە، ئەمان تۆ نە!› ☰ لیکن

**ئەمان**[٥]: دەنگ. ١. وشەی وەڕەزی و تووڕەیی ‹ئەمان لە دەستت! ئەمان چەند گەرمایە!› ٢. دەغیلە ‹ئەمان قەدری بزانن ئەم کتێبە/ لە دنیا ئێستەکێ هەمتای نەماوە «حاجی قادر»› ٣. هاوار ‹ئەمان مردم، عیلاجێ، سا لە ڕێی پێغەمبەرا چارێ/ ویسال، یا قەتڵە، یا تەسکین، لە هەرسێ بۆم بکەن کارێ «مستەفابەگی کوردی»› ☰ ١. آخ ٢. زنهار ٣. فریاد

**ئەمان‌نامە** / emanname/: ناو. نووسراوەیەکی فەرمی دەوڵەتیی بریتی لەوەی کە خاوەنی ئەو نووسراوە گیان و ماڵی پارێزراوە ☰ امان‌نامە

**ئەمانە** / emane/: جێناو. یانە؛ ئەڤانە؛ ئەوانە ☰ اینها

**ئەمانەت** / emanet/: ناو. ئامانەت؛ کاری ڕاگرتنی شتێ بۆ دانەوە ‹وەفای عەهدە، لە من ڕۆح و لە تۆ ماچ/ چییە چارەی ئەمانەت غەیری تەسلیم؟ «نالی»› ☰ امانت

**ئەمانەتدار**[١] / emanetdar/: ناو. ئەمانەتیدار؛ کەسێ کە پاراستنی ئەمانەتی لە ئەستۆیە ☰ امانتدار

**ئەمانەتدار**[٢]: ئاوەڵناو. دەسپاک؛ ئەمین؛ ئەمیندار؛ دەستپاکژ؛ دروستکار لە ئەمانەتداریدا ☰ امانتدار

**ئەمانەتداری** / emanetdarî/: ناو. دەسپاکی؛ دەستپاکژی؛ چاودێری لە ئەمانەتی خەڵک ☰ امانتداری

**ئەمانەتی** / emanetî/: ئاوەڵناو. ئامانەتی؛ خواس؛ قەرەتی؛ ڕاگیراو بۆ دانەوە ☰ امانتی

**ئەمبار** / embar/: ☜ هەمار

**ئەمپریالیست** / empiryalîst/: ئاوەڵناو. *[ڕامیاری]* خاوەن دەزگای ئەمپریالیسم. هەروەها: ئەمپریالیستی ☰ امپریالیست

**ئەمپریالیسم** / empiryalîsm/: ناو. *[ڕامیاری]* دوا قۆناغی سیستەمی سەرمایەداری بە شێوەی لێ هەڵکەوتنی قۆرغگەلی گەورە و دەسەڵاتانی ماڵی لە هەموو جیهاندا، بە ناردنی سەرمایە بۆ وڵاتانی ژێرفەرمان و گێرە و کێشە نانەوە بۆ زاڵ بوون بە سەر ئەو وڵاتانەدا ☰ امپریالیسم

**ئەمپول** / empûl/: ☜ ئامپول

**ئەمجا** / emca/: ئاوەڵکار. ١. ئەم جارە؛ ئەم ڕا ‹ئەمجا پێت ناڵێم› ٢. لەمە زیاتر؛ سەرەڕای ئەمە ‹ئەمجا ئەگەر گرتتیان چی؟› ٣. دواتر؛ بە دوای ئەمە ‹ئەمجا مەوەستە تا دەگەیە عەینی سەرچنار/ ئاوێکە پڕ لە نار و چنار و گوڵ و چنوور «نالی»› ☰ ١. بار دیگر ٢. وانگهی ٣. آنگاه

**ئەمجار** / emcar/: ئاوەڵکار. ئەمجارە؛ ئیمجا؛ ئیمجار؛ ئەمڕا؛ ئەم کەشە ☰ این بار

**ئەمجارە** / emcare/: ☜ ئەمجار

**ئەمجاریش** / emcarîş/: ئاوەڵکار. دیسان؛ دیسانەوە؛ دووبارە ☰ باز؛ ایضاً

**ئەمجۆرە** / emcore/: ئاوەڵکار. ولێ؛ ئاوا؛ بەم تەرزە ☰ این‌طور

**ئەم دەمە** / em deme/: ئاوەڵکار. ئێستا؛ ئێستاکە ☰ اکنون

**ئەمر** / em(i)r/: ناو. ١. فەرمان؛ دەستوور؛ دەسوور؛ عەمر ‹ئەو کەسە تەحدیسی نیعمەت بێ موراد و مەتلەبی/ میسلی نالی ئیمتیسالی ئەمری یەزدانیی دەکا «نالی»› ٢. عومر؛ تەمەن ☰ ١. امر ٢. عُمر؛ سن

⊡ **ئەمری خودا بەجێ هێنان**: ☜ ئەمری خوا کردن

**ئەمری خودا کردن:** ئـەمری خـوا بـەجێ هێنـان؛ مردن؛ کۆچی دوایی کردن 🇮🇷 وفات کردن

**ئەمراز** / emraz/: ☜ **ئامراز**

**ئـەمرۆ** / emro/: نـاو. هـەرمێ؛ هـەمرۆ؛ ئـەمروو؛ ئەمroوله 🇮🇷 گلابی

**ئەمروو** / emrû/: ☜ **ئەمرۆ**

**ئەمرووله** / emrûle/: ☜ **ئەمرۆ**

**ئەمڕا** / emřa/: ☜ **ئەمجار**

**ئەمڕۆ**[١] / emřo/: نـاو. ئەڕۆ؛ ئـەوڕۆ؛ ئیمـڕۆ؛ ئەڤـڕۆ؛ ئێڕۆ؛ ئیرۆ؛ ئاڕۆ: ١. ڕۆژێ کـە تێـدایین ‹سـوبحی فەروەردینـە ئەمـڕۆ، بولبـولی دڵ بـێ غەمـە/ گـەر لەخۆشـییا ڕۆحـی دەرچـێ باخـەوان، هێشـتا کەمـە «بێخود»› ٢. ڕۆژگار؛ سەردەم ‹جوانی ئەمڕۆ، پیری سبەیە «مەسەل»› 🇮🇷 ١و٢. امروز

**ئەمڕۆ**[٢]: ئاوەڵکار. ئەوڕۆ؛ ئیمڕۆ؛ ئەڤڕۆ؛ ئێـڕۆ؛ ئـاڕۆ: ١. لە ئەمڕۆوە ‹ئەمڕۆ ئەبێ مامۆستای کورد/ دانیشێ و بە ڕاوێژی ورد ... «گـۆران»› ٢. لـەم ڕۆژگـارەدا ‹ئەمڕۆ کەس بە گوێی کـەس ناکـا› 🇮🇷 ١. امـروز ٢. امروزه

**ئـەمڕۆژ** / emřoj/: نـاو. ئەوڕۆکـە؛ ئـەم ڕۆژگـارە ‹چاوەدێری ڕۆژی خۆشی جێژنی سەربەستیم ئەمن/ گەر مودارا وا دەگـەڵ ئەمـڕۆژی تاڵـی خـۆم دەکـەم «هێمن»› 🇮🇷 امروز

**ئـەمڕۆ . سبەی** / emřo s(i)bey/: نـاو. ئیمـڕۆ و شەوسۆ 🇮🇷 امروز و فردا

⊡ **ئەمڕۆ.سبەی کردن:** ئیسە و تاوێ تر کـردن؛ دوا خستن و جێبەجێ نەکردنی کارێک 🇮🇷 امروز و فردا کردن

**ئەمڕۆکە** / emřoke/: ئاوەڵکار. ئەوڕۆکە؛ لـەم ڕۆژە یـان ڕۆژگـارەدا ‹نیشـتمان ئەمڕۆکـە ڕەشپۆشـی شەهیدی بانەیـە/ داغـداری کـردەوەی ئـەو دەسـتە خوێنڕێژانەیە «ئاوات»› 🇮🇷 امروزه

**ئـەمڕۆیی** / emřoyî/: ئاوەڵـناو. ئیمـڕۆژی؛ بابـەتی ئەمڕۆ 🇮🇷 امروزی

**ئەمسار** / emsar/: ☜ **ئەمساڵ**

**ئەمساڵ**[١] / emsał/: ناو. ئیسـاڵ؛ ئیسـاڵ؛ ئیمسـاڵ؛ ئەمسـار؛ ئەمسـەر؛ ساڵـێ کـە تێیـدایین ‹بـەری ئەمساڵ باش بوو› 🇮🇷 امسال

**ئەمساڵ**[٢]: ئاوەڵـکار. ئیسـاڵ؛ ئیسـاڵ؛ ئیمسـاڵ؛ ئەمسار؛ ئەمسەر؛ لە ساڵێ کە تێیدایین ‹ئەمساڵ تۆ نەکەی بۆ ساڵی دوایـی/ مـانگی خـەرمانان دەکـەی گەدایی «هەژار»› 🇮🇷 امسال

**ئەمسەر** / emser/: ☜ **ئەمساڵ**

**ئەمسەرڤەرا** / emservera/: ناو. ساڵـێ کـە دوای ئەم ساڵەیە 🇮🇷 سال آینده

**ئەمشۆ** / emşo/: ☜ **ئەمشەو**

**ئەمشەو**[١] / emşew/: ناو. ئەمشۆ؛ ئیمشـەو؛ شـەوێ کە تێیدایین یا شەوێک کـە دێ ‹ئەمشـەو شـەوی شەمبەیە› 🇮🇷 امشب

**ئەمشەو**[٢]: ئاوەڵکار. ئەمشۆ؛ ئیمشەو؛ لە شەوێک کە تێیـدایین یـان بـە دوای ئەمـڕۆژدا دێ ‹ئەمشـەو ناخەوم› 🇮🇷 امشب

**ئەمشێر** / emşêr/: ناو. هەمشـێر؛ نـاودێر؛ بـەربژار؛ ناڤـکری؛ کەسـێ کـە بـۆ ئـەنجامدانی کارێـک دەستی لە سەر نراوە یان بۆ خۆی هاتۆتە پێشەوە 🇮🇷 نامزد؛ کاندید

**ئـەملاولا** / emlawla/: ناو. دەوروبـەر؛ دۆرانـدۆر 🇮🇷 دوروبر

⊡ **ئـەملاولا کـردن:** جێگـــای زۆر گـــەڕان بـــۆ دۆزینەوەی شتێ یان ڕێکەوتنی کارێک 🇮🇷 بالا و پایین کردن

**ئەمڵە** / emłe/: ناو. ئۆردووگا 🇮🇷 اردوگاه

**ئەمما** / emma/: ئامراز. بەڵام؛ بەلآن؛ ئـەما؛ ئـەڵێ ‹عوزار و زولفی تـۆ بـێ شـک شـەو و ڕۆژ پێکـەوەن، ئەمما/ شەو و ڕۆژ پێکەوەن! لەو وەجهە من حەیران و داماوم «وەفایی»› 🇮🇷 اما

**ئەمن** / emin/: جێناو. مـن؛ ئـەز؛ وژم؛ م ‹گـەرچی تووشی ڕەنجەڕۆیی و حەسرەت و دەردم ئەمن/ قەت لە دەس ئـەم چەرخـە سپلـە نابـەزم، مـەردم ئـەمن «هێمن»› 🕮 من

**ئەمن** / emn/: ئاوەڵناو. بێ‌ترس؛ هـێمن ‹دریـغ بـۆ خانەدانی حارس ئاغای سەروەری ئاکۆ/ کـە جێگـەی عەیش و عەشـرەت، مەنبـەعی ئـەمن و ئـەمانێ بـوو «شێخ ڕەزا»› 🕮 امن

**ئەمونـەو** / em û ew/: جێنـاو. مـرۆی نەناسـراو؛ خەڵکی غەوارە ‹بە ڕۆژ تاکوو دووبارە دێتـەوە شـەو/ لە کاتێکدا کە دەدوێنم ئەم و ئـەو ... «هـێمن»› 🕮 این‌وآن

⊡ **ئەم و ئەو کردن**: هـەر ڕۆژێ لەگـەڵ دۆسـت و دلدارێکدا بوون ‹بلا ڕۆحت موقەددەس بێ، ئەم و ئەو کردنت بەس بێ/ هەتا ئاخر هەناسە ئەو بناسە، هەر بنازە بەو «مەحوی»› 🕮 این و آن کردن

**ئەموست** / emust/: ☜ **ئەنگوست**

**ئەموستانە** / emustane/: ☜ **ئەنگوستیلە ـ٢**

**ئەموستبەستە** / emustbeste/: ئاوەڵـناو. *[مـەجاز]* هەڵخەڵەتاو؛ فریودراو 🕮 فریب‌خورده

**ئەموستەچاو** / emusteçaw/: ☜ **ئەنگوستەچاو**

**ئەموستەوێڵە** / emustewêle/: ☜ **ئەنگوستیلە ـ١**

**ئەمو** / emû/: نـاو. مام؛ ئاپۆ؛ ئاپ؛ بـرای بـاوک 🕮 عمو

**ئەمووس** / emûs/: ☜ **ئەنگوست**

**ئەمە**[1] / eme/: جێنـاو. ١. ئێمـە؛ مـە؛ ئـەم؛ یەکـەم کەسی کـۆ ٢. یـە؛ هـەوە؛ ئینـە؛ ئـەوەی نزیـک ‹ئەمەت ناوێ؟› 🕮 ١. ما ٢. این

**ئەمە**[2]: ئـامراز. ئەرێ؛ بۆ پێداگری ‹ئەمە کچەکـە بـۆ شوو ناکەی؟› 🕮 راستی

**ئەمەتە** / emete/: ☜ **ئەمەهە**

**ئەمەسا** / emesa/: ناو. ئەوەتا؛ هانی 🕮 اینک

**ئەمەک** / emek/: ☜ **ئەمەگ**

**ئەمەگ** / emeg/: ناو. ئەمەک؛ هەمەک؛ هەمـەگ: ١. وەفا؛ بەینـەت؛ سـفەت؛ خـۆڕاگری لـە سـەر دۆستی یان بەڵێن ‹هاسـان نییـە، دۆسـتی گرانـە/ دۆستایەتی و ئەمەگ برانە «هەژار، *مەم و زیـن*»› ٢. ڕەنج و زەحمەت؛ ئەرک ‹عومری بێ‌حاسڵـی مـن چوو بە عەبـەس/ ئەمـەگم هـەرچی هـەبوو چـوو بـە عەبەس «نالی»› 🕮 ١. وفا ٢. رنج؛ زحمت

**ئەمەگدار** / emegdar/: ئاوەڵناو. بەئەمەگ؛ بـەوەفا 🕮 باوفا

**ئەمـەگناس** / emegnas/: ئاوەڵـناو. قـەدرناس 🕮 قدرشناس

**ئەمەل** / emel/: ناو. *[ئەدەبی]* ئارەزوو؛ هومێد؛ ئاوات ‹هەر چەندە کە عومری خـزر و جـامی جـەمت بـوو/ چونکـوو ئەمـەلت زۆرە چ عـومرێکی کـەمت بـوو! «نالی»› 🕮 امل؛ آرزو

**ئەمـەن** / emen/: ئاوەڵـکار. ئەمەنـد؛ ئەوەنـدە؛ ئەوەند؛ هێندە؛ ئەوقاس؛ ئەونە 🕮 آن قدر

**ئەمەندوچکـە** / emendûçke/: ئاوەڵـکار. ئەمەندووسـکانە؛ ئەمەندووسـکە؛ ئەمەندووکانـە؛ ئەمەندووکانێ؛ ئەمەندووکە؛ ئەم تۆزە؛ ئەم ڕەیـزە؛ ئەم تۆسقاڵە ‹ئەمەندووچکە خوێم بـەرێ!› 🕮 یـک ذرّه

**ئەمەندوسکانە** / emendûskane/: ☜ **ئەمەندوچکە**

**ئەمەندوسکە** / emendûske/: ☜ **ئەمەندوچکە**

**ئەمەندوکانە** / emendûkane/: ☜ **ئەمەندوچکە**

**ئەمەندوکانێ** / emendûkanê/: ☜ **ئەمەندوچکە**

**ئەمەندوکە** / emendûke/: ☜ **ئەمەندوچکە**

**ئەمەندە** / emende/: ئاوەڵکار. ئەمەننە؛ ئەوهەندە؛ ئەمەنگە؛ ئەم هەمووە؛ ئەم گشتە ‹چییە ئەم هەموو تەنتەنە و مـن منـت/ ئەمەنـدە چییـە فـەخر و بـەخ کردنت؟ «مەحوی»› 🕮 این همه

**ئەمەنگە** / emenge/: ☜ **ئەمەندە**

**ئەمەننە** / emenne/: ☜ **ئەمەندە**

**ئەمەنە** / emene/: ئاوەڵکار. هێندە؛ ئەوەندە؛ ئەونە ▤ آنقدر

**ئەمەهە** / emehe/: جێناو. ئەمەتە؛ ئائەمە ‹ئەمەهەم گەرەکە› ▤ همین

**ئەمەیان** / emeyan/: ☜ **ئەمیان[2]**

**ئەمیا** / emya/: ئاوەڵکار. ئێرە؛ ئەیرە؛ ئێگرە ▤ اینجا

**ئەمیان[1]** / emyan/: ناو. هەمیان؛ کیسەی چکۆلەی لە چەرم، بۆ جێی پارە و زێڕ و ... ▤ کیسەی چرمی

**ئەمیان[2]**: جێناو. ئەمەیان؛ ئەمیانە؛ ئەم یەکە ‹ئەمیان لەوانیتر جوانترە› ▤ این یکی

**ئەمیر** / emîr/: ناو. فەرمانڕەوا؛ سەرەک؛ مەزنی خەڵک ▤ امیر

**ئەمین** / emîn/: ئاوەڵناو. ١. دەسپاک؛ جێ‌متمانە ٢. خاترجەم؛ ئارخەیان ▤ ١. درُستکار ٢. مُطمئن

**ئەمیندار** / emîndar/: ناو. کارگێڕ و سەرکاری ئاغا بۆ بەڕێوە بردنی کاروباری خەرمان هەڵگرتن ▤ امیندار

**ئەمێ[1]** / emê/: ئاوەڵناو. مێ؛ مێوینە؛ مێنگە ‹جوانووی ماینەکەمان ئەمێیە› ▤ مادینە

**ئەمێ[2]**: جێناو. ئەم شوێنە؛ ئەمیا؛ جێی بەر باس ‹وەرە ئەمێ شتێکت دەمێ› ▤ اینجا

**ئەمێستا** / emêsta/: ئاوەڵکار. ئەمێستاکە؛ ئەمێستاکێ؛ ئەمێستەکانێ؛ ئەمێستەکوونێ؛ ئەمێستەکێ؛ هەرئێستا؛ ئێستاکە؛ بێ‌درەنگ؛ نهۆ؛ نووکە؛ ئانا؛ هەوکە ‹هەتا تۆم ئاشنا بووی ئاشنام بوون/ ئەمێستا مووبەمووم ئەغیارە بێ تۆ «نالی»› ▤ هم اکنون

**ئەمێستاکە** / emêstake/: ☜ **ئەمێستا**

**ئەمێستاکێ** / emêstakê/: ☜ **ئەمێستا**

**ئەمێستە[1]** / emêste/: ناو. ئەمێستا ‹لە بیری ئەمێستەتدا بە!؛ ئەمێستەت ڕۆیی بە بیری سبەوە!› ▤ اکنون

**ئەمێستە[2]**: ئاوەڵکار. ئەمێستەکانێ؛ ئەمێستەکوونێ؛ ئەمێستەکێ؛ ئەمێستا ‹ئەمێستە بە چییەوە سەرقاڵی؟› ▤ حالا

**ئەمێستەکانێ** / emêstekanê/: ☜ **ئەمێستا**

**ئەمێستەکوونێ** / emêstekûnê/: ☜ **ئەمێستا**

**ئەمێستەکێ** / emêstekê/: ☜ **ئەمێستا**

**ئەنا** / ena/: ئاوەڵکار. ١. ئەنیا؛ وەگەرنە؛ دەنا؛ ئەگینا ‹گورج وەرەوە ئەنا بە جێو دێڵم› ٢. ئێستە؛ ئیسە‹ئەنا دێم› ▤ ١. وگرنە ٢. اکنون

**ئەنار** / enar/: ☜ **هەنار**

**ئەنارلو** / enarlû/: ناو. هەنارستان؛ باغی هەنار ▤ انارستان

**ئەناز** / enaz/: ناو. ژمار؛ هەژمار ▤ شمار

**ئەنازە** / enaze/: ☜ **ئەندازە**

**ئەنام** / enam/: ☜ **ئەندام**

**ئەنبار** / enbar/: ☜ **هەمار**

**ئەنباز** / enbaz/: ئاوەڵناو. هاوئامێز؛ هاوباوەش؛ باوەش تێک‌وەرێناو ▤ هم‌آغوش

**ئەنبە** / enbe/: ☜ **عەمبە**

**ئەنتەر** / enter/: ☜ **عەنتەر**

**ئەنتیک** / entîk/: ☜ **ئەنتیکە**

**ئەنتیکە[1]** / entîke/: ناو. ئانتیک؛ ئەنتیک؛ حەنتیکە؛ کەلوپەلی زۆر کەونارا ‹ئەنتیکەی زۆریان تالان کرد!› ▤ عتیقە

**ئەنتیکە[2]**: ئاوەڵناو. ئانتیک؛ ئەنتیک؛ حەنتیکە؛ کەم‌وێنە ‹کورەکەی ئەنتیکەیە› ▤ مورد پسند

**ئەنتیکەخانە** / entîkexane/: ناو. عەنتیکەخانە؛ حەنتیکەخانە؛ مووزە؛ جێگای هەڵگرتن، پاراستن و ڕانانی شتی زۆر بەنرخ و کەونارا ▤ موزە

**ئەنتیکەفرۆش** / entîkef(i)roş/: ناو. عەنتیکەفرۆش؛ فرۆشیاری شتی کەونارا. هەروەها: **ئەنتیکەفرۆشی** ▤ عتیقەفرش

**ئەنتیکەناس** / entîkenas/: ناو. ئەوی لە ناسین و هەڵسەنگاندنی شتی کەونارا شارەزایە ≣ عتیقەشناس

**ئەنتیموان** / entîmwan/: ناو. توخمی کیمیایی، بە ژمارەی ئەتومی ٥١ و کێشی ئەتومی ١٢١,٧٥، کە لە پیشەسازی و بژیشکیدا بە کار دێ ≣ آنتیموان

**ئەنجا** / enca/: ئاوەڵکار. ئەمجار؛ ئەنجار؛ ئەم دەحە ≣ آنگاه

**ئەنجار** / encar/: ☚ **ئەنجا**

**ئەنجام** / encam/: ناو. دوایی؛ دوماهی؛ کۆتایی کار، ڕەوت یا دیاردەیەک ≣ انجام؛ پایان

⊡ **ئەنجام بوون**: جێبەجێ بوون؛ پێکهاتن ≣ انجام شدن

**ئەنجام دان**: جێبەجێ کردن؛ پێکهێنان ≣ انجام دادن

**ئەنجامە** / encame/: ناو. لاولاوەی دەرک و پەنجەرە ≣ لولا

**ئەنجران** / enc(i)ran/: چاوگ. جنیان؛ جن ـ جن بوون؛ جەنیای ≣ قیمه شدن

**. ئەنجن** / encin-/: پاشەوشە. جنراو؛ ئەنجنراو؛ لەت کراو ‹گۆشتئەنجن› ≣ انجیده

**ئەنجن . ئەنجن** / encin encin/: ئاوەڵناو. لەتوپەت؛ لەت ـ لەت؛ شڕوشیتاڵ ‹کە سینەی ڕیشمی بەو تیغی نازەی ئەنجن ـ ئەنجن کرد/ وتی پەژموردەیە ئەم لالەزارە، ئاوی تێ دەگرم «مەحوی»› ≣ تکه ـ تکه

⊡ **ئەنجن .ئەنجن کردن**: ☚ **ئەنجنین**

**ئەنجنئەنجنکراو** / encin'encink(i)raw/: ئاوەڵناو. قیمه ـ قیمه ≣ قیمەشده

**ئەنجنان** / enc(i)nan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //ئەنجنای؛ دەنجنێ؛ بنجنێ// ئەنجران؛ ئەنجن ـ ئەنجن کران؛ ئەنجنران ≣ انجیده شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ئەنجناو/ چاوگی نەرێنی: نەئەنجنان

**ئەنجناو** / enc(i)naw/: ئاوەڵناو. ئەنجنراو؛ لەتلەتکراو بە تیغ ≣ انجیده

**ئەنجنران** / encinran/: ☚ **ئەنجنان**

**ئەنجنراو** / encinraw/: ☚ **ئەنجناو**

**ئەنجنین** / enc(i)nîn/: چاوگ. تێپەڕ. //ئەنجنیت؛ دەئەنجنی؛ بئەنجنە// ئەنجن ـ ئەنجن کردن؛ ورد کردن بە تیغ ≣ انجیدن؛ قیمه کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نە(ئە)نجنین

**ئەنجوڕ** / encuř/: ناو. ئەنجوور؛ عەنجور؛ خرچە؛ قەرەخرچە؛ کاڵەکی کاڵ؛ گندۆرەی ساوای نەگەیشتوو ≣ خربُزەی نرسیده

**ئەنجومەن** / encumen/: ناو. کۆڕ؛ مەجلیس ‹ئەنجومەنی شارەوانی› ≣ انجمن

**ئەنجوور** / encûr/: ☚ **ئەنجوڕ**

**ئەنجە** / ence/: ئاوەڵناو. وردە پارچەی بچووک و باریک ≣ ریزه

**ئەنجەت** / encet/: ناو. هەجەت؛ بەهانە؛ بیانوو؛ بیانگ؛ بیانک ≣ بهانه

**ئەنجەل** / encel/: ☚ **ئەجەل**

**ئەنجەڵ** / enceł/: ☚ **ئەجەل**

**ئەنجەنای** / encenay/: چاوگ. ئەنجنین ≣ انجیدن

**ئەنجەنیای** / encenyay/: چاوگ. ئەنجران ≣ انجیده شدن

**ئەنجیر** / encîr/: ☚ **هەنجیر**

**ئەنجینە** / encîne/: ناو. ئێزنگ؛ ئێزینگ؛ قەلاشکەری؛ داری شکاو بۆ ئاگری زستان ≣ هیزُم

**ئەند** / end/: ئاوەڵکار. هێند؛ هەن ≣ آنقدر

**ئەنداز** / endaz/: ☚ **ئەندازە**

**ئەندازە** / endaze/: ناو. ئەنازە؛ ئەنداز؛ هەد؛ قاس؛ هەند؛ ڕادە؛ گۆرە؛ گۆرەبا؛ گزارە؛ پێودانگ؛ هند:

١. وەند؛ قاب؛ قەرا؛ قەبارە؛ ئەوەندەی کە بۆ هەڵسەنگاندن تەرخان کراوە ‹ئەندازەی کەوش› ٢. ڕادەی ئاسایی و وەرگیراو ‹دزی و فزی لە ئەندازە دەرچووە!› ☰ ١و٢. اندازە

⊡ **ئەندازە بوون:** بە قەد بوون ‹ئەو پاتۆڵە ئەندازەمە› ☰ اندازە بودن

**ئەندازە گرتن:** پێوان ‹درێژاییەکەی ئەندازە بگرە! بینێرە بۆم› ☰ اندازە گرفتن

**ئەندازەگر** / endazegir/: ناو. لە گەزدەر؛ کەس یان ئامرازێ کە شتێک دەپێوێ ☰ اندازەگیر؛ مَساح

**ئەندازیار** / endazyar/: ناو. موهەندیس: ١. دەرچووی زانکۆی ئەندازیاری ٢. نژیارڤان؛ ئارشیتکت؛ ئەندازیاری گەلالە دارڕژتنی خانوو ☰ ١و٢. مُهندس

**ئەندازیاری** / endazyarî/: ناو. موهەندیسی: ١. کار یان پیشەی ئەندازیار: *ئەلف)* فەننی نەخشەڕێژی ماشین *ب)* گۆڕان و ڕێکخستنی دیاردەگەل ٢. کاربەری زانست بەتایبەت بیرکاری و فیزیک، بۆ کەڵک بردن لە تایبەتمەندی ماک و وزە لە سروشتدا، بە شێوەی پێکهاتە، بەرهەم، دەزگا و شتی‌تر ☰ ١و٢. مُهندسی

**ئەندام** / endam/: ناو. ئەنام؛ هەندام؛ هەنداو: ١. ١. لەبات؛ بەشێ لە پێکهاتەی شتێ ‹چاو ئەندامی بینایی مرۆڤە› ٢. پەل؛ هەرکام لە پێکهێنەرانی کۆمەڵێک ‹ئەندامی کۆمەڵگا› ٣. کەسێ کە لە لایەن پارت، کۆمەڵە یان دەستەیەکەوە گل دراوەتەوە ‹ئەندامی کۆمەڵەی ژینگەپارێزی› ٤. بەژن؛ پەیکەر؛ گۆدە؛ گۆڤدە؛ کەلەخ؛ کەلەستە؛ گەت؛ قەوارە؛ قەواژ؛ قەلافەت؛ لەش‌ولار ‹بازدێم وەی زامەت وەی ئەندامەوە/ بەڵ بەیان وە شۆن باز بێزامەوە «مەولەوی»› ☰ ١تا٣. عضو ٤. اندام

**ئەندامەتی** / endametî/: ناو. ئەندامییەتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ئەندام بوون ☰ عضویت

**ئەندامییەتی** / endamîyetî/: ☜ **ئەندامەتی**

**ئەندۆ** / endo/: ناو. کوڵ؛ خەم؛ کەسەر؛ غەم؛ پەژارە؛ خەفەت ‹ئەوەند زاری کەرد نە ئەندۆی دەروون/ خورۆش کەرد نە سەنگ قولەی بێستوون «خانا»› ☰ اندوە

**ئەندۆک** / endok/: ناو. داردۆژەنگ؛ ناودۆک؛ داری ناوەڕاستی مەشکە ☰ چوب میانی مشک

**ئەندووکە** / endûke/: ناوەڵکار. ئەوەندووکە؛ هێندێکی کەم ☰ اندک

**ئەندەروون** / enderûn/: ناو. ١. هەناو؛ ناو ورگ ٢. هندروو؛ هوندروو؛ خانووی ژن و منالی پیاوەگەورە ☰ ١. درون ٢. اندرونی

**ئەندەروونی** / enderûnî/: ناو. هەندروو؛ هندروو؛ خانووی پشتەوە؛ جێگای ژن و منداڵی پیاوی گەورە ☰ اندرونی

**ئەندیشە** / endîşe/: ناو. بیر؛ ویر ☰ اندیشە

**ئەندێش** / endêş/: ناو. ئەندێشە؛ ئەنێش: ١. هزر؛ بیر ٢. ترس؛ خۆف ☰ ١. اندیشە ٢. هراس؛ خوف

**ئەندێشان** / endêşan/: چاوگ. بیر لێ کردنەوە ‹ئامۆزا دیسان مشت ڕائەکێشێ/ لە کەس ناترسێ هیچ نایئەندێشێ «قانع»› ☰ اندیشیدن

**ئەندێشە** / endêşe/: ☜ **ئەندێش**

**ئەنراندن** / enrandin/: چاوگ. زویر کردن؛ ئازار دان ☰ آزُردن

**ئەنروک** / enruk/: ناوەڵناو. زووڕەس؛ تایبەتمەندی شتێ، بەتایبەت میوەیێ کە زووتر لە کاتی ئاسایی خۆی پێ دەگا ☰ زودرس

**ئەنرین** / enrîn/: چاوگ. زویر بوون؛ ئازار دران ☰ آزردە شدن

**ئەنزەڕووت** / enzerût/: ☜ **عەنزەڕووت**

**ئەنستیتۆ** / enistîto/: ناو. ١. بنکە ٢. بنکەی زانستی ٣. بەڕێوەبەرایەتی فێرکاری زانستی ☰ ١تا٣. انستیتو

**ئەنعا** / en'a/: ناو. حاشا؛ ئینکار؛ کاری ڕاستی وەشارتن ☰ انکار

**ئەنعام** / en'am/: ناو. خەلات ☰ انعام

**ئەنفال** / enfal/: ناو. ١. *[ئیسلام]* دەسکەوتگەلی شەڕ؛ زەوی بایەر، جەنگەڵ، کان و میراتی بێمیراتبەر کە بۆ فرۆش نابێ و دەبێتە ماڵی هەموو موسوڵمانان ٢. زنجیرە ڕەشکوژییەکانی ڕژێمی بەعسی عیراق لە کوردان، بەتایبەت لە هەشتاکانی سەدەی بیستەمدا، بە ئامانجی لە ناو بردنیان ٣. وشەیەکی باو بۆ ڕەشکوژی لە هەرکوێدا ☰ ١تا٣. انفال

**ئەنفالکراو** / enfalk(i)raw/: ئاوەڵناو. ڕەشکوژکراو؛ بە گەل کوژراو ☰ انفال شده

**ئەنفلۆئەنزا** / enf(i)lo'enza/: ☜ ئانفلۆئانزا

**ئەنقەس** / enqes/: ☜ ئەنقەست

**ئەنقەست** / enqest/: ئاوەڵکار. ئەنقەس؛ ئانقەست ‹ئەنقەست نەمدواند› ☰ عمداً

**ئەنگارە** / engare/: ناو. پێوانە ☰ پیمانه

**ئەنگافتن** / engaftin/: ☜ ئەنگاوتن

**ئەنگافتە** / engafte/: ☜ ئەنگاوتە

**ئەنگافتی** / engaftî/: ☜ ئەنگاوتە

**ئەنگاڤتە** / engavte/: ☜ ئەنگاوتە

**ئەنگامە** / engame/: ناو. ١. هەرا و هووریا؛ گۆتاوەڕۆ؛ گۆنگەشە؛ گۆنگەر؛ گوردەم؛ زڵە؛ چڕەبەندان؛ گورمۆڕە؛ چەقە و گورە؛ هەڵڵا؛ دۆخی بریتی لە ئاپۆرەدان و هەرا ـ هەرای خەڵکی لە شوێنێکدا ٢. هەڕەت؛ جەنگە؛ گۆبەن ☰ ١و٢. هنگامه

**ئەنگاوتن** / engawtin/: چاوگ. تێپەڕ. //ئەنگاوتت؛ دەئەنگێوی؛ بئەنگێوە// ئەنگافتن؛ هنگافتن؛ هنگفتن؛ هەنگافتن؛ هەنگاوتن؛ پێکان؛ لە نیشانە دان؛ ل ئامانج خستن ‹دەمیشم وتییە زمانم/ من بە درێژی تۆ دەخورم/ مەپرینگێوە! بئەنگێوە!/ سەر و بەر بکەی دەتبرم «پەشێو»› ☰ به هدف زدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەئەنگاوتن

**ئەنگاوتوو** / engawtû/: ☜ ئەنگاوتە

**ئەنگاوتە** / engawte/: ئاوەڵناو. ئەنگافتە؛ ئەنگاڤتە؛ ئەنگاوتوو؛ ئەنگافتی؛ ئەنگێوراو؛ پێکراو؛ هەنگاو؛ هەنگاوتە؛ هەنگاوتوو ‹چۆن نەناڵێ ئەو دڵە ئەنگاوتەیە؟/ بەرد لە بەردی بێتەوە دەنگی هەیە «هێمن»› ☰ مورد اصابت واقع شده

**ئەنگدان** / engdan/: ناو. قاخلیە بەهارە؛ شەماڵگیر؛ گیایەکی گوڵ زەردە ☰ گیاهی با گل‌های زرد

**ئەنگڕان** / eng(i)řan/: چاوگ. ١. لە ئەندازە دەرچوون؛ لە ڕادەبەدەر بوون ٢. *[مەجاز]* لە خۆ بایی بوون ☰ ١. از حد گذشتن ٢. مغرور شدن

**ئەنگژ** / engij/: ئاوەڵناو. تووڕە؛ قەڵس ☰ خشمگین

**ئەنگژین** / eng(i)jîn/: چاوگ. تووڕە بوون؛ عنرین؛ ڕق هەستان ☰ خشمگین شدن

**ئەنگڵ** / engił/: ☜ هەنگڵ

**ئەنگوان** / eng(i)wan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //ئەنگوای؛ دەئەنگوێی؛ بئەنگوێ// هەنگوان؛ پێکران؛ وێکەوتن؛ پێکیان؛ هەنگێوران ‹لاسەشۆڕێک بووم غەنیمی دوژمنان/ ئێستە ئەنگواوم بە تیری چلکنان «هێمن»› ☰ به هدف خوردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەئەنگوان

**ئەنگواو** / eng(i)waw/: ئاوەڵناو. پێکراو؛ ئەنگافتە ☰ تیرخورده

**ئەنگوتران** / engutran/: ☜ ئەنگێوران

**ئەنگوتک** / engutik/: ☜ ئەنگوتکە

**ئەنگوتکبژێر** / engutikb(i)jêr/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* ئەنگوتکژمێر؛ گونکژمێر؛ خەسیس؛ ڕژد ☰

خسیس

**ئەنگوتكژمێر** / engutikj(i)mêr/: ☜ **ئەنگوتكبژێر**

**ئەنگوتكە** / engutike/: ناو. ئەنگوتک؛ گونک؛ گونتک؛ گوتک؛ تۆپەڵە هەویری خڕ هەڵدراو، بەشی نانێک ■ چونه

**ئەنگوتكەهەویر** / engutkehewîr/: ناو. چونا؛ گڤشک؛ گونک؛ گوتکەهەویر ■ چونەی خمیر

**ئەنگوچک** / enguçik/: ناو. ئانگوچک؛ ئەنوچک؛ هووچک؛ هەنگوچک؛ گوچک؛ لەوەندی؛ فەقیانە؛ قۆڵە کراسی فش و فۆڵ و درێژ ■ آستین بلند

**ئەنگوچکەسۆرانی** / enguçkesoranî/: ناو. قۆچک؛ لەوەندی؛ جۆری ئەنگوچکی تایبەتی جل‌وبەرگی سۆرانی ■ آستین بُلند نوعی لباس کُردی

**ئەنگوس** / engus/: ☜ **ئەنگوست**

**ئەنگوست** / engust/: ناو. ئەموست؛ ئەمووس؛ ئەنگوس؛ ئەنگۆس؛ ئەنگووس؛ هنگست؛ هنگوست؛ هونگوست؛ هەنگوست؛ قامک ‹پێنج ئەنگوست دەبنە یەک مست «هەژار»› ■ انگشت

**ئەنگوستانە** / engustane/: ☜ **ئەنگوستیلە ـ٢**

**ئەنگوستلەچاو** / engustleçaw/: ☜ **ئەنگوستەچاو**

**ئەنگوستەچاو** / engusteçaw/: ناوەڵناو. *[مەجاز]* ئەموستەچاو؛ ئەنگوستلەچاو؛ تاریکایی خەست، وا کە هیچ دیار نەبێ ‹لە ئەنگوستەچاوی دڵی خێوی کێوا/ بەرەو دەر، بەرەو شاری دەریا بەرێوە «سوارە»› ■ بسیار تاریک

**ئەنگوستەویلە** / engustewîle/: ☜ **ئەنگوستیلە ـ١**

**ئەنگوستیلە** / engustîle/: ناو. ئەنگووسەوانە؛ گوستیل؛ پەنجەوانە: ١. ئەموستەوێڵە؛ ئەنگوستەویلە؛ هنگلیسک؛ هنگوستیل؛ هنگوستیلک؛ هنگولیسک؛ هونگوستیل؛ هونگوستیلک؛ هەنگوستیل؛ هەنگوستیلک؛ هەنگولیسک؛ کلکەوانە؛ گشتانە؛ گشتر؛ کلوانک؛ کۆلکانە؛ کلکانە؛ کلوانگ؛ کلوانە؛ ئەنگولیسک؛ هەنگوسانە؛ ئەنگوستانە؛ ئەنگوشتەر؛ ئەوستیلە؛ هونگولیر؛ هنگلیسک؛ هنگولسیک؛ گوستیل؛ گوستیلک؛ گوستیرک؛ قامکەوانە؛ ئالقەی خشڵی قامک ٢. ئەموستانە؛ ئەنگوستانە؛ هنگستۆ؛ هنگوستۆک؛ هونگوستر؛ گوزڤان؛ قووچەکە؛ سەرتلی؛ سەرتلیک؛ هەنگوستیر؛ هنگوستۆک؛ تبلک؛ کۆڤک؛ قوومچک؛ تلەک؛ دەزگا؛ دەسگا؛ نازەنگوشت؛ کێلکەوانە؛ کەفە؛ قووچەکە دورمان؛ ئامرازێکی زۆرتر کانزایی کە کاتی دروومان بە سەر قامکیدا دەکەن ■ ١. انگشتری ٢. انگشتانه

**ئەنگوش** / enguş/: ناو. مەیگوو؛ کێچی دەریا ■ میگو

**ئەنگوشتەر** / enguşter/: ☜ **ئەنگوستیلە ـ١**

**ئەنگولیسک** / engulîsk/: ☜ **ئەنگوستیلە ـ١**

**ئەنگۆ** / engo/: جێناو. هنگ؛ هنگۆ؛ هنگوو؛ هۆنگۆ؛ هوونگ؛ هەنگوو؛ هن؛ هۆن؛ هوون؛ هووین؛ هەڤە؛ هەوە؛ ئێوە؛ وە؛ تۆ و خەڵکی‌تر ■ شُما

**ئەنگۆرە**[1] / engore/: ناو. ١. هەنگۆرە؛ ئەنگۆری؛ ئەنگۆرێ؛ هەنگڤار؛ زەردەپەڕ؛ تەنگی ئێوارە؛ نزیک خۆراوا؛ زەردەی خۆراوا؛ یەرەووۆتەنگ؛ وێرەگا؛ وەرەگا؛ تاریکان؛ ڕۆژپەڕ؛ درەنگان؛ هەڕەتگای تەنگ؛ ئێوارەی درەنگ ‹چێشتی خۆش سەر لە ئەنگۆرە دیارە «مەسەل»› ٢. سەرەتای هەڕەت ‹لە ئێستارا ئەنگۆرەی میوەیە› ■ ١. تنگ غروب ٢. هنگامه

**ئەنگۆرە**[2]: ناوەڵکار. ئەو ساتە؛ ئەو دەم؛ ئەو کاتە ‹مەسلەحەت ناکرێ، بە زۆرە. با ئێوارە دابێ، ئەنگۆرە تێی دەبینین مەسلەحەتێ ... «بەیت»› ■ آنگاه

**ئەنگۆری** / engorî/: ☜ **ئەنگۆرە[1]ـ١**

**ئەنگۆرێ** / engorê/: ☜ **ئەنگۆرە[1]ـ١**

**ئەنگۆس** / engos/: ☜ **ئەنگوست**

**ئەنگوتران** / engûtran/: ☜ **ئەنگێوران**

**ئەنگوتن** / engûtin/: چاوگ. تێنەپەڕ. //ئەنگووتت؛

دەنگێوی؛ بنگێوە// ١. هەڵاتنی تـاک ئەسـتێرە ٢. شنین؛ شنیان؛ هەڵکردنی بای هێدی ‹هەناسـەم زولفەکـەی لادا و مـەیلێکی نـەکرد چـاوی/ نەسـیم ئەنگووت و شەو ڕابـرد و نـەرگس هـەر لـە خەودایـە «نالی»› ☰ ١. طلوع کردن ٢. وزیدن ملایم

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەئەنگووتن

**ئەنگوور** / engûr/: ☜ هەنگوور

**ئەنگووس** / engûs/: ☜ ئەنگووست

**ئەنگووسەوانە** / engûsewane/: ☜ ئەنگووستیلە

**ئەنگەمە** / engeme/: ناو. بەڵا؛ چۆرتم ☰ بلا

**ئەنگیر** / engîr/: ☜ هەنگوور

**ئەنگینار** / engînar/: ناو. کەنگەر ☰ کنگر

**ـ ئەنگێز** / engêz-/: پاشگر. ـــ بـزوێن؛ ـ هێـژێن؛ وەدیهێنەر ‹ز ڕەعنا نێرگزین تەی مەست و خونریز/ زەمان بوو عەهدی جەنگ‌ئەنگێزی چـەنگیز «مـەلای جزیری»› ☰ ـ انگیز

**ئەنگێزە** / engêze/: ناو. هۆ؛ مایـەی سـەرەکی ☰ انگیزه

**ـ ئەنگێو** / engêw-/: پاشەوشە. ١. پێکەر؛ لێـدەری ئامانج ‹چەن‌هـەزاران تفـەنگچی مووئـەنگێو/ چـەن کـوڕی سـەفدڕی جیهـانی هەیـە «قـانع»› ٢. گـەز ‹گائەنگێو؛ بارئەنگێو› ☰ ١و٢. ـ زن

**ئـەنگێوران** / engêwran/: چـاوگ. تێنەپـەڕ. نادیـار. //ئـەنگێورای؛ دەنگێـورێی؛ بنگێـورێ// ئـەنگوتران؛ ئەنگووتران؛ هـەنگێوران؛ ئـەنگوان: ١. وە نیشـانە کەوتن ٢. پێکـران؛ وەبەرکـەوتن ☰ ١. بـە هـدف خوردن ٢. مورد اصابت واقع شدن

■ ئاوەڵناوی بـەرکاری: ئـەنگێوراو/ چـاوگی نـەرێنی: نەئەنگێوران

**ئەنگێوراو** / engêwraw/: ☜ ئەنگاوتە

**ئـەنگێوە**[1] / engêwe/: نـاو. ١. دەسـتڕاسـت؛ نیشان‌ئەنگێو؛ لە ئامانج‌دەر ‹ئەنگێوەی وەک سمکۆ هەر نابێتەوە› ٢. *[ڕێبووس]* زەنەی سەر پیت ☰ ١. تیرانداز ماهر ٢. سکون

**ئـەنگێوە**[2]: ئاوەڵـناو. گەزنـدە؛ گـازگر؛ بـە تایبـەتی پێکان و گەسـتن و پـێ‌دانـەوە ‹ئـەمینی شـێتییە مەحوی! لە مەکری نەفسی ئەمماره/ مەگەر ڕەحمـی خودا دەم‌بەستی کا ئەم مارە ئەنگێوە «مـەحوی»› ☰ گزنده

**ئەنـنـە** / enne/: ئاوەڵکار. ئەمەنە؛ ئەونـە؛ ئەوەنـدە؛ ئەقەڕڕە ☰ آنقدر

**ئەنوا** / enwa/: ناو. ئانوا؛ عەنوا: ١. پـەناگا؛ پـەنا و پەسـیو؛ جـێ حەوانـەوەی شـەو ٢. شـوێنی باران‌نەگر ٣. دارایی؛ ماڵ؛ سامان ☰ ١. پناهگاه ٢. جای پناه از باران ٣. دارایی

**ئەنوچک** / enuçik/: ☜ ئەنگوچك

**ئەنووێر** / enuwîr/: ☜ هەنگوور

**ئەنو** / enû/: ناو. ئەندۆ؛ خەم؛ پەژارە ☰ اندوه

**ئەنوز** / enûz/: ☜ وەنەوز

**ئەنوس** / enûs/: ☜ وەنەوز

**ئەنە**[1] / ene/: ☜ هەوێ

**ئەنە ـ**[2]: پێشگر. تێ ؛ دە نێو ‹ئەنەکەوتـەی› ☰ در؛ اندر؛ توی (چیزی)

**ئەنـەخورد** / enexurd/: ئاوەڵـناو. دەژ؛ دەژ و دەق؛ دەکارنەکراو؛ دەست‌لێ‌نەدراو ☰ دست‌نخورده

**ئەنەزا** / eneza/: ☜ هەنەزا

**ئەنی** / enî/: ناو. ١. هەنیە؛ تـوێڵ؛ نـاو چـاوان ٢. بەرە؛ شوێنێ کە تێیدا دوو گرۆی دژ بە یەک لـە شـەڕدان ‹ئـەنیا شـەڕ› ٣. *[ڕامیـاری]* بـەرە؛ دەستەگەلێ بـە بـیر و دۆزی جیـاوازەوە کـە بـۆ گەیشتن بە ئامانجێکی هاوبـەش، یـەک دەگـرن ‹ئەنیا ڕزگارییا نەتەوەیی› ☰ ١. پیشانی ٢و٣. جبهه

**ئەنیا**[1] / enya/: ناو. هێز و گوڕ؛ وزە و توانا ☰ رمق

**ئەنیا**[2]: ☜ ئەنا ـ١

**ئەنی‌بەند** / enîbend/: ناو. توێڵـبەند؛ خـەمری ☰ پیشانی‌بند

**ئەنیژ** / enîj/: ناو. بووماران؛ بۆژانە ☲ بومادران

**ئەنیش** / enîş/: ناو. ↓

⊡ **ئەنیش لێ نیان**: ئاوڕ لێ دانەوە؛ پاپەی بوون (زۆرتر لە ڕستەی نەرێنیدا دەگوترێ) ‹کوڕەکە تەواو گەرەکییە وەلێ کەنیشکەکە ئەنیشی لێ نانێ› ☲ محل گذاشتن

**ئەنیشک** / enîşk/: ☜ ئانیشك

**ئەنیگرێ** / enîg(i)rê/: ئاوەڵناو. ڕووگرژ؛ مۆن ☲ اخمو

**ئەنیگەش** / enîgeş/: ئاوەڵناو. ڕووخۆش؛ ڕووگەش ☲ خوشرو

**ئەنیمەیشێن** / enîmeyşên/: ناو. کارتۆن؛ فیلمی لە نەقاشی دروستکراو ☲ انیمیشن

**ئەنیور** / enîwr/: ☜ هەنگور

**ئەنیوور** / enîwur/: ☜ هەنگور

**ئەنێش** / enêş/: ☜ ئەندێش

**ئەو**[1] / ew/: ناو. ئاو ☲ آب

**ئەو**[2]: ئاوەڵناو. هۆ؛ ئا؛ وێ؛ هێما پێ کراو ‹ئەو ئەسپە چەند جوانە!› ☲ آن

**ئەو**[3]: جێناو. ١. هێما بۆ دوور ‹ئەو نانە بخۆ!› ٢. هێما بۆ نزیک ‹ئەومان هەڵگرت› ٣. هێما بۆ مێرد ‹ئەو (مێردەکەم) چووە بۆ شار› ☲ ١. آن ٢. این ٣. او (شوهرم)

**ئەو**[4]: ئامراز. لە؛ بە ‹سەوزە وستەن فەرش ئەو چەمەن دەس ـ دەس/ گولان جام وە دەس بولبولان سەرمەس «مەولەوی»› ☲ به

**ئەو**[5]: پێشگر. ئەم ـ ‹ئەوسال؛ ئەوشۆ› ☲ ام ـ

**ئەوئالی** / ew'alî/: ئاوەڵکار. ولا؛ ئەولا ☲ آن‌سو

**ئەوئسبێ** / ew'sbê/: ☜ ئاومرواری

**ئەوا** / ewa/: ئاوەڵکار. ئەوە؛ وشەی خەبەردان لە ڕووداو ‹ڕەفیقان! من ئەوا ڕۆییم لە لاتان/ لە مەزلوومان بلا چۆڵ بێ ولاتان «نالی»› ☲ اینک

**ئەواگل** / ewagil/: ناو. قەگەڕ؛ ڕەوتی گەڕانەوە؛ وەگەڕان ☲ بازگشت

**ئەوان**[1] / ewan/: ئاوەڵناو. هێما پێ کراوان ‹ئەوان ئەسپانە وەبەستە!› ☲ آن‌ها

**ئەوان**[2]: جێناو. ١. ئەوانەی دوور ‹ئەوان بۆیان هێنام› ٢. ئەم نزیکانە ☲ ١. آن‌ها ٢. این‌ها

**ئەواندن** / ewandin/: ☜ هەباندن

**ئەوانگل** / ewangil/: جێناو. لە مە چێتر؛ جندۆکە و فریشتەگەل ☲ از ما بهتران

**ئەوانگەل** / ewangel/: ناو. [مەجاز] میەسڵ؛ جندۆکە؛ جنۆکە ☲ جن و پری

**ئەوانە** / ewane/: جێناو. ئەونە؛ وان؛ یانە ‹تازە نابینم ئەوانە تاوەکوو ڕۆژی حەشر/ ڕۆیین و نابیندرێن، تازە زەمان نایێتەوە «ئاوات»› ☲ آن‌ها

**ئەوبەر**[1] / ewber/: ئاوەڵکار. لای ئەو لا؛ ڤێ ڕەخی؛ لە لای دوورترەوە ‹ئەوبەر کەسی لێ نەماوە› ☲ آن طرف

**ئەوبەر**[2]: ئاوەڵناو. ئامتا؛ هاوتا ‹کەس ئەوبەری ئەو نەبوو لە ڕاوا› ☲ همتا

**ئەوپەڕ** / ewpeř/: ناو. ١. کۆتایی؛ دوایی؛ ئەنجام ‹ئەوپەڕی ئەم کارە نادیارە› ٢. بنەتا؛ ئاخر ‹ئەوپەڕی جوامێری نواند› ☲ ١و٢. نهایت

**ئەوتا** / ewta/: ☜ ئەوەتا

**ئەوتاندن** / ewtandin/: چاوگ. ئەوتا؛ وەڕین ☲ پارس کردن

**ئەوتر** / ewtir/: جێناو. ئەویتر؛ ئەوی دیکە ‹ئەوتر هەڵگرە› ☲ آن یکی

**ئەوتشت** / ewtişt/: جێناو. هەرامە؛ وانێک؛ هین ☲ چیز

**ئەوتۆ** / ewto/: ئاوەڵناو. وا؛ وەها؛ شیاوی باس ‹کارێکی ئەوتۆش نەبوو› ☲ آنچنانی

**ئەوتین** / ewtîn/: چاوگ. وەڕین؛ حەپە کردن ☲ پارس کردن

**ئەوج** / ewc/: ناو. تەشق؛ بڵندایی ☲ اوج

**ئەوجا** / ewca/: ئاوەڵکار. ئەوجار؛ ئەوجارە: ١. ئەم دەم؛ ئەو سایە؛ ئەم کەڕەتە ‹ئەوجا هیچ ناڵێم تا تۆ قسەکانت تەواو دەکەی› ٢. کەوایە؛ کەوابوو ‹ئەوجا دەنووم› ⊏ ١. این بار ٢. پس

**ئەوجار** / ewcar/: ئاوەڵکار. ١. ☜ ئەوجا ٢. ئەو ڕا؛ ئەو کەڕەتە؛ ئەو جارە ⊏ ١. ☜ ئەوجا ٢. آن دفعه

**ئەوجارە** / ewcare/: ☜ ئەوجا

**ئەوجارەکانێ** / ewcarekanê/: ☜ ئەوجارەکە

**ئەوجارەکە** / ewcareke/: ئاوەڵکار. ئەوجارەکانێ؛ ئەم جارە؛ ئەم کەڕەتە ⊏ این‌بار

**ئەوجاڕ** / ewcař/: ناو. ١. دوو خوشکی ژنی دوو برا بۆ یەکتر ٢. ☜ هەوجار ⊏ ١. دو جاری که خواهر باشند ٢. ☜ هەوجار

**ئەوجوە** / ewc(i)we/: ☜ ئاوجۆ

**ئەوجە** / ewce/: ناو. ئەوەجە؛ نیاز؛ ئاتاجی؛ پێداویستی ⊏ احتیاج

**ئەودالْ** / ewdał/: ☜ عەودالْ

**ئەودنیا** / ewdinya/: ناو. ئاخیرەت؛ دنیای پاش مردن ⊏ آخرت

**ئەودەر**[1] / ewder/: ناو. دەرەوە؛ دەرڤە ⊏ بیرون؛ خارج

**ئەودەر**[2]: ئاوەڵکار. دەرەوە؛ دەرڤە ‹بێ شەرت و شوێنیت جە حەد ئەودەرەن/ ڕەحمەت ئەو یادت، وفادارتەرەن «مەولەوی»› ⊏ بیرون

**ئەودەم** / ewdem/: ☜ ئەوسا

**ئەور** / ewr/: ناو. هەور؛ عەور ⊏ ابر

**ئەورا** / ewra/: ☜ ئاورا

**ئەوراز** / ewraz/: ☜ هەوراز

**ئەوردا** / ewirda/: ☜ ئەوێ[2]

**ئەورە** / ewre/: ئاوەڵکار. ئەوێ؛ ئەوێنە؛ ڤێدەرێ ⊏ آنجا

**ئەورەیلە** / ewreyle/: ☜ ئەوێ[2]

**ئەوڕاو** / ewřaw/: ناو. دەرفەت؛ هەل ⊏ فُرصت

**ئەوڕۆ** / ewřo/: ☜ ئەمڕۆ

**ئەوڕۆکە** / ewřoke/: ☜ ئەمڕۆکە

**ئەوژوو** / ewjû/: ناو. هێز و توانا؛ بڕشت؛ وزە ⊏ توان؛ رمق

**ئەوسا**[1] / ewsa/: ناو. ئەودەم؛ ئەو کات؛ کاتێکی بێجگە ئێستا ‹ئەوسا خۆشتر بوو تا ئێستا› ⊏ آن زمان

**ئەوسا**[2]: ئاوەڵکار. ئەودەم: ١. ئەو کات؛ ڤێ گاڤێ ‹ئەوسا چەکی دانا و دەستی بۆ قەڵەم برد› ٢. جا؛ ئیمجا؛ ئەمجار ‹ئێوە بواچین حالات وێتان/ ئەوسا شەرح وێم ماچوو پەرێتان «خانای قوبادی»› ٣. زوو؛ لە کۆندا ‹منیش ئارەزووی ئەوسام نەماوە، عەشقم گۆڕاوە/ دڵم هەر وەکوو گوڵی بێباران، سیس و ژاکاوە «بێکەس»› ⊏ ١. آنگاه ٢. سپس ٣. پیش از این

**ئەوسار** / ewsar/: ☜ هەوسار

**ئەوساکە** / ewsake/: ئاوەڵکار. لەو دەمەدا؛ دە ئەو کاتەدا؛ لەوێ چاخێدا ‹ئەوساکە دوژمن پێی زانی/ ڕەگی ئەو دارە ئەرخەوانە/ بنجی قووڵی وەک ژیانە «شێرکۆ»› ⊏ آن دم

**ئەوسایچ** / ewsayç/: ئاوەڵکار. تازە؛ ئەوسا؛ ئەوساکە؛ جاخۆ ‹ئەوسایچ ئێمە بەر لە ئێوە لێرە بووین!› ⊏ تازه

**ئەوستیلە** / ewistîle/: ☜ ئەنگوستیلە ـ١

**ئەوسێ** / ewsê/: ☜ ئاوی ڕەش

**ئەوشۆ** / ewşo/: ناو. ئیمشەو؛ شەوێ کە تێداین ⊏ امشب

**ئەوق** / ewq/: ئاوەڵناو. قەتیس؛ دەرەتان لێبڕاو؛ گیرخواردوو ⊏ گرفتار

**ئەوقاس** / ewqas/: ئاوەڵکار. ئەوەندە؛ ئەونە؛ هێندە ⊏ آنقدر

**ئەوقە** / ewqe/: ئاوەڵکار. ئاوقا؛ گیرۆدە؛ تووشیار؛ تووش ⊏ دُچار

**ئەوک** / ewk/: ناو. قوڕگ؛ ئوک؛ بەشێک لە کۆئەندامی هەرسە کە دەکەوێتە نێوان دەم و سووڕێنچک ☰ حلق

**ئەوکات** / ewkat/: ئاوەڵکار. ئەوسا؛ ئەو وەختە ☰ آنگاه

**ئەوکاتە** / ewkate/: ئاوەڵکار. هەنگین؛ ئەوسا؛ ئەودەم ☰ آنگاه؛ آن زمان

**ئەوکێ** / ewkê/: جێناو. هەین؛ وانێک؛ واک؛ هەرامە؛ چت ☰ چیز

**ئەوگار** / ewgar/: ئاوەڵناو. کز و داماو؛ سیس هەڵگەڕاو ‹مالاتش سەرجەم وە دەرد ئەوگارەن/ هەرد هەوارگەش مافەتەدارەن «مەولەوی»› ☰ افکار

**ئەولا**[1] / ewla/: ئاوەڵکار. لەودوا؛ پاشان ‹ئەولا چ دەکەی؟› ☰ زان پس

**ئەولا**[2]: جێناو. ڤێرەخ؛ ئەو تەرەف ‹ئەملای لادا و ئەولای هێنایە پێشەوە› ☰ آن طرف

**ئەولاتر** / ewlatir/: ئاوەڵکار. هێندێک دوورتر ‹ئەولاتر دانیشە! با لێم نەکەوی› ☰ آن‌طرف‌تر

**ئەولاد** / ewlad/: ناو. ڕۆڵە؛ فرزەند ☰ اولاد

**ئەولە** / ewle/: ئاوەڵکار. خاترجەم؛ ئارخەیان؛ بە دڵنیاییەوە ☰ بی‌تردید

**ئەولەق** / ewleq/: ☜ ئەبڵەق ـ١

**ئەولەگا** / ewlega/: ناو. پەنا؛ پەسیو؛ حەشارگە ☰ پناهگاه

**ئەونە** / ewne/: ☜ ئەوەندە

**ئەوە**[1] / ewe/: ناو. ئەڤە؛ شەونم؛ خوناوە ☰ شبنم

**ئەوە**[2]: جێناو. ئەڤە: ١. ئاماژە بە دوور ‹ئەوە داوە و خۆتی لێ لادە!› ٢. ئاماژە بە مرۆ ‹ئەوە براتە› ٣. ئاماژە بە شتی نزیک ‹ئەوە دەخۆم!› ☰ ١. آن ٢. آن (شخص) ٣. این

**ئەوە**[3]: ئامراز. ئەڤە: ١. ئەرێ؛ ئەی؛ ڕاستی ‹ئەوە چت کردووە بێ من؟ هێمن!/ تیر و تانەت فرە لێمن، پێمن «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ٢. خۆ؛ دیارە ‹ئەوە من دەستم ناگاتە بەرۆکێی هێندە بڵێندە دەبێ نێردیوانێکی بۆ دروست کەم لە داری عەنابێ ... «بەیت»› ☰ ١. راستی ٢. از آنجا کە

**ئەوەتا** / eweta/: ئامراز. ئەوەتانێ؛ ئەوتا؛ ئەوەتە؛ خۆیەتی ‹ئەوەتا لەو دوورەوە دەرکەوت› ☰ خودش است

**ئەوەتانێ** / ewetanê/: ☜ ئەوەتا

**ئەوەتلنەی** / ewetilney/: ☜ تلاندن

**ئەوەتلیەی** / ewetilyey/: ☜ تلان

**ئەوەتە** / ewete/: ☜ ئەوەتا

**ئەوەتەی** / ewetey/: ئاوەڵکار. ئەوەتی؛ لەو ساوە؛ لەو کاتەوە؛ ژڤێ ڤەختێ؛ لەو دەمەوە ‹پیرم و ئەوەتەی لە بیرمە، ژینم تاڵە/ هەر خۆزگە بە پارە و گلەیی لەم ساڵە « هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ☰ از آن دم

**ئەوەتی** / ewetî/: ☜ ئەوەتەی

**ئەوەجە**[1] / ewece/: ☜ ئەوجە

**ئەوەجە**[2]: ئاوەڵناو. ١. ئاتاج؛ موحتاج ٢. پێویست ☰ ١. نیازمند ٢. ضروری

**ئەوەجەیی** / eweceyî/: ناو. پێویستی ☰ نیاز

**ئەوەزبیەڵ** / ewezb(i)yeł/: ☜ ئاڵوگۆڕ ـ١

**ئەوەژیوەی** / ewejîwey/: چاوگ. زیندوو بوونەوە؛ ژووژانەوە ☰ جان گرفتن

**ئەوەسا** / ewesa/: ئاوەڵکار. ئەودەم؛ هنگی ☰ آنگاه

**ئەوەکزیەی** / ewekizyey/: چاوگ. سووتانەوە؛ برژانەوە ☰ سوختن (پوست)

**ئەوەکە**[1] / eweke/: جێناو. ئەوی دی؛ ئەوی کە ☰ آن یکی

**ئەوەکە**[2]: ئامراز. شتەکە؛ وانەکە؛ هەرامەکە؛ هینەکە ☰ چیز

**ئەوەڵ** / eweł/: ئاوەڵناو. یەکەم؛ ئێکەمین؛ هەوەڵ ☰ اول

**ئەوەڵی**[1] / ewelî/: ئاوەڵناو. یەکەمین 🇮🇷 اولین

**ئەوەڵی**[2]: ئاوەڵکار. سەرەتا؛ لە بەرا؛ دە پێشدا ‹ئەوەڵی گەرەکم نەبوو بێم› 🇮🇷 ابتدا

**ئەوەمووچنەی** / ewemûçney/: چاوگ. گلۆفین؛ گلفچاندن؛ گلوچاندن 🇮🇷 مُچاله کردن

**ئەوەنامەی** / ewenamey/: چاوگ. نەهاتنەوە؛ ڕۆیشتنی بێ گەڕانەوە 🇮🇷 بازنیامدن

**ئەوەند** / ewend/: ☜ ئەوەندە

**ئەوەندووکە** / ewendûke/: ☜ ئەندوکە

**ئەوەندە** / ewende/: ئاوەڵکار. ئەوەند؛ ئەونە؛ ئەوەنە؛ ئەڤەندە؛ ئەڤەهێندە؛ ئەڤەرە؛ هێندە؛ ئەوقاس؛ ڤێقاسێ؛ ئەو هەندە ‹ئەوەندە بکۆشم خۆی بێتە کۆشم «مەسەل»› 🇮🇷 آنقدر

**ئەوەندەی** / ewendey/: ئامراز. ئەونە؛ تا ئەو ڕادە ‹ئەوەندەی لێ دەزانم بەم نەزانی خۆمەوە مەحوی/ بە چاوی سەر خودابینە، بە چاوی دڵ خودازانە «مەحوی»› 🇮🇷 آن اندازه

**ئەوەندی** / ewendî/: ئاوەڵکار. ئەگەرچی؛ هنگی 🇮🇷 هرچند

**ئەوەنە** / ewene/: ☜ ئەوەندە

**ئەوەی** / ewey/: جێناو. چش 🇮🇷 آنچه؛ هرآنچه

**ئەوهە** / ewhe/: ئاوەڵناو. ئەمە؛ ئەڤە؛ یە 🇮🇷 این

**ئەوهەندە** / ewhende/: ☜ ئەمەندە

**ئەوی** / ewî/: جێناو. ١. هەرکێ؛ هەر کەسێک؛ هەرچی ٢. ئەوەی؛ هەرچێکی 🇮🇷 ١. هرکه ٢. آنچه

**ئەویا** / ewya/: ☜ ئەوێ ـ٢

**ئەویتر** / ewîtir/: جێناو. ئەوتر؛ هێدن؛ ئادی ‹ئەم دامرکا، ئەویتر هەڵگرسا› 🇮🇷 آن یکی

**ئەویکە** / ewîke/: ☜ ئادی

**ئەوین** / ewîn/: ☜ ئەڤین

**ئەویندار** / ewîndar/: ☜ ئەڤیندار

**ئەویندارانە** / ewîndarane/: ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. عاشقانە 🇮🇷 عاشقانه

**ئەوینداری** / ewîndarî/: ناو. ئەڤینداری؛ عاشقی؛ بەندەواری؛ دلداری؛ دۆخ یان چۆنیەتی عاشق بوون ‹برسییەتیت نەکێشاوە، ئەویندارییت لە بیر باتەوە! «مەسەل»› 🇮🇷 عاشقی

**ئەوینی** / ewînî/: ☜ ئەڤینی

**ئەوێ**[1] / ewê/: ئاوەڵکار. ١. ئەوێندەرێ؛ ئەونە؛ ئەویا؛ لەوێ؛ لەویا؛ لەهۆوێ؛ هۆئەوێ؛ لەینە؛ لەوێنە؛ لوێنە؛ لەورە؛ دەوێ؛ چا؛ چاگە ‹ئەوێ دانیشە!› ٢. ڕەنگە؛ وێدەچێ؛ گاهەس؛ شایەد؛ شایەت ‹ـ تۆ بێژی ئازاد بێ؟ ـ ئەوێ!› ٣. دەبێ؛ ئەبێ؛ ئەشێ ‹ئەوێ هەر بچێ، نەچێ دەری ئەکەم!› 🇮🇷 ١. آنجا ٢. شاید ٣. باید

**ئەوێ**[2]: جێناو. ئەویا؛ هۆوێ؛ هۆئەوێ؛ ئەورە؛ ئەورا؛ ئەوردا؛ ئەورەیلە؛ ئۆگە؛ ئێنە؛ وا؛ واگە ‹ئەوێ شوێنێکی خۆشە!› 🇮🇷 آنجا

**ئەوێدەمێ** / ewêdemê/: ئاوەڵکار. وێجاری؛ ئەوساکە 🇮🇷 آنگاه

**ئەوێستا**[1] / ewêsta/: ناو. ١. ئەوێستە؛ ئێستا؛ نهۆ؛ نووکە ‹ئەوێستا هەلی وەستانەوەیە؛ ئەوسا خۆش بوو تا ئەوێستا› ٢. ئاوێستا؛ کتێبی پیرۆزی زەردەشت 🇮🇷 ١. اکنون ٢. اوستا

**ئەوێستا**[2]: ئاوەڵکار. ئەوێستە؛ ئێستا؛ نهۆ؛ نووکە 🇮🇷 اکنون

**ئەوێستاکە** / ewêstake/: ئاوەڵکار. هەرئێستا؛ هەمانهۆ؛ نووکە؛ هەوکە 🇮🇷 هم‌اکنون

**ئەوێستاکێ** / ewêstakê/: ☜ ئەوێستا[2]

**ئەوێستایی** / ewêstayî/: ☜ ئاوێستایی

**ئەوێستە** / ewêste/: ☜ ئەوێستا[2]

**ئەوێسێ** / ewêsê/: ☜ ناوی ڕەش

**ئەوێندەرێ** / ewênderê/: ☜ ئەوێ[1]ـ١

**ئەوێنە** / ewêne/: ☜ ئەینە[2]

**ئەه** / eh/: دەنگ. وشەی وەڕەزی و گوێ نەدان ‹ئەها ئێستا چی لێ بکەم؟› 🇮🇷 اَه

**ئەها**[1] / eha/: دەنگ. ١. وشەی ئاگادار کردن ‹ئـەها هات!› ٢. وشەی عەزرەت ‹ئـەها شـیرەکە ڕژا!› ٣. وشەی باوەڕ بە سەیر مانەوە ‹ئەها، کە وا بێ خـەنی بووە› ٤. دەس خۆش؛ ئامرازی پەسن کردن ‹ئەها! ڕێک خۆیەتی› ☰ ١. حرف تنبیـه ٢. حـرف تحسُـر ٣. حرف تصدیق و تعجب ۴. حرف تحسین

**ئەها**[2]: سارستە. ئەهانێ؛ سەیر کە؛ تەماشا کا ‹ئـەها چیم کڕیوە؟› ☰ ببین

**ئەهاک** / ehak/: ☜ **ئاهەك**

**ئەهالی** / ehalî/: نـاو. خەڵـکی ئـاوایی تێکـڕا ☰ اهالی

**ئەهانێ** / ehanê/: ☜ **ئەها**[2]

**ئەهاو** / ehaw/: دەنگ. ١. هۆ؛ هۆی؛ وشەی بانگ کردنی دوور ٢. وشەی گەمە پێکردن ‹ئـەهاو بـۆ کارێ کردت› ☰ ١. هان ٢. کلمەی تمسخر

**ئەهای** / ehay/: دەنگ. هۆی؛ وشەی بانگ کردنی دوور ☰ هی؛ آهای

**ئەهریمەن** / ehrîmen/: ناو. ئاهریمەن؛ شەیتان ☰ اهریمن

**ئەهل** / ehl/: ئاوەڵـناو. ١. سـەردەرچوو؛ خـاوەن هێژایی بۆ کارێ یان شتێک ٢. شـیاو؛ شـایان ٣. خوازیار ‹ئەوەندەی ئەهلی دنیان ئـەهلی دنیـا، تاقـە ڕۆژێ گەر/ بە قـەڕنێ مـن ئەوەنـدە ئـەهلی خـوا بم، دەبمە پێغەمبەر! «مەحوی»› ٤. ئارام؛ هێدی؛ ژێـر ‹ماشەڵـلا مناڵـەکانی گشـت ئـەهلن› ٥. خـاوەن؛ خودان ‹ئەهلی قەڵەم› ☰ ١. ماهر؛ وارد ٢. شایسـتە ٣. مایل ۴. مؤدب ۵. صاحب

**ئەهلی** / ehlî/: ئـامراز. ١. خەڵکی؛ سـەر بـە وڵاتی ‹لە ڕۆما کەوتە بەرچاوم کەسێکی هـائیم و حـەیران/ بە هەیئەت تێی گەییم کـوردە، بـە شـێوەی ئـەهلی کوردستان «حـاجی قـادر»› ٢. هـۆگر و سەرقاڵـی ‹ئەهلی حاڵ؛ ئەهلی نوێژ؛ ئەهلی کار› ☰ ١و٢. اهلِ

**ئەهلیحەق** / ehlîĥeq/: نـاو. لقێکـی ئـایینی لـە کوردستان کـە داب و نـەریتی تایبـەتی خۆیـان هەیە و لایان عەلی کوڕی ئـەبیتالیب لـە هـەموو کەسـێک بـەرزترە و بـە خـاوەن دەسـەڵاتێکی تایبەت لە لایەن خوداوە دەزانن ☰ اهل‌حق

**ئەهوەن** / ehwen/: ئاوەڵناو. ئەهۆن؛ ئاهۆن؛ هێدی؛ لەسەرخۆ ☰ آرام

**ئەهۆ** / eho/: ☜ **ئەهو**

**ئەهۆن** / ehon/: ☜ **ئەهوەن**

**ئەهۆی** / ehoy/: دەنگ. هۆ؛ هـۆی؛ وشـەی بانـگ کردنی دوور ☰ آهای

**ئەهو** / ehû/: دەنـگ. ئـەهۆ؛ وشـەی سـەیرمان و وەڕەزی ‹ئەهوو! ئەوە دەڵێی چی؟› ☰ هی

**ئەهێو** / ehêw/: دەنگ. وشەی گاڵتە پێکـردن ☰ زکی

**ئەی**[1] / ey/: ئاوەڵناو. ئەم؛ ئەیە؛ ئی ‹جـارێ‌تـر ئـەی قسە مەکە› ☰ این

**ئەی**[2]: دەنـگ. ١. وشـەی گـازی؛ بانـگ ‹ئـەی ڕەفیقان! سوحبەتی نالی مەکەن/ بۆچ؟ کە من لـەوڕا وەکوو بەدناوم ئەز «نـالی»› ٢. ئـەدی ‹ئـەی کـەی دێت؟› ٣. مەگەر ‹ئەی نەمگوت مەچۆ!› ٤. وشەی سەیرمان ‹ئـەی کـە سـەیرە!› ٥. بـۆ کـوڵ و داخ ‹ئەی ڕۆ!؛ ئەی ماڵی وێـرانم!› ☰ ١. آی ٢. پـس ٣. مگر ۴. وه ۵. ای

**ئەیا** / eya/: ناو. دایک؛ داڵک ☰ مادر

**ئەیاخ** / eyax/: ئاوەڵـناو. قرپـۆک؛ بـێ‌نـرخ ☰ بی‌ارزش

**ئەیار** / eyar/: ناو. مانگی پێنجەمی ساڵی هەتاوی وڵاتانی عەرەبی کە ٣١ ڕۆژە، بەرانبەر بـە مـانگی زایینی مەی ☰ ایار

**ئەیارە** / eyare/: ناو. پێوانە؛ عـەیارە؛ دەفـرێ کـە شتی وردی وەک دەغڵی پێ دەپێون ☰ پیمانه

**ئەیاغ**[1] / eyağ/: نـاو. ١. پۆخڵـەوات؛ خرکـەوپرکـە؛ کەل‌وپەلی بێ‌نرخ ٢. ئاوەڕۆ؛ ڕەهەند؛ ژێراوی ئاوی

پیس و ئاودەسخانە 🇮🇷 ۱. خرت‌وپرت ۲. فاضلاب

**ئەیاغ**[۲]: ئاوەڵناو. پۆخڵە؛ قرپۆک؛ چرووک؛ بێبڕەو 🇮🇷 بُنجُل

**ئەیچۆن** / eyçon/: سارستە. ئارێ؛ ناخۆ 🇮🇷 البتە

**ئەیچە** / eyçe/: ☜ **ئەیچی**

**ئەیچی**[۱] / eyçî/: ئاوەڵکار. ئەیچە؛ نیشانەی پاداگری و دڵنیایی 🇮🇷 چرا کە نە

**ئەیچی**[۲]: سارستە. ئەیچە؛ ئەرێ وایە؛ ڕاست دەکەی 🇮🇷 درست است

**ئەیدز** / eyd(i)z/: ناو. نەخۆشییەکی تووشی ویرووسی، کە بە هۆی پێوەندی جنسی لەگەڵ نەخۆش یان وەرگرتنی خوێنی تووشیارەوە تووشی مرۆڤ دەبێ و هێزی بەرگری لەش دادەبەزێنێ 🇮🇷 ایدز

**ئەیر** / eyr/: ☜ **ئاگر**

**ئەیرە** / eyre/: ☜ **نێرە**

**ئەیرەکڵێ** / eyrek(i)łê/: ناو. ئاتەشبازی؛ ئاگربازی؛ گەمە بە ئاگر 🇮🇷 آتشبازی

**ئەیرۆ** / eyřo/: دەنگ. ۱. وشەی سەیرمان ۲. هەیرۆ؛ وشەی خەمخۆری 🇮🇷 ۱. وا ۲. ای وای

**ئەیژی** / eyjî/: ئاوەڵکار. ئێژی؛ ئەیژیتە؛ دەڵێی؛ ئەڵێی؛ چمای 🇮🇷 گویی؛ انگار

**ئەیژیتە** / eyjîte/: ☜ **ئەیژی**

**ئەیڤەز** / eyvez/: ئاوەڵناو. ئامادە؛ ساز؛ حازر ‹ئەز ئەیڤەزم› 🇮🇷 آمادە

**ئەیڤەزاندن** / eyvezandin/: چاوگ. ئامادە کردن؛ ساز کردن 🇮🇷 فراهم آوردن

**ئەیڤەزین** / eyvezîn/: چاوگ. ئامادە بوون؛ ساز بوون 🇮🇷 فراهم شدن

**ئەیلۆ**[۱] / eylo/: ☜ **هەڵۆ**

**ئەیلۆ**[۲]: دەنگ. ۱. بچکۆلەی قشت و جوانکیلە ‹ئەیلۆ گەزە ـگەزە نازانێ!› ۲. وشەی بانگ کردنی کۆمەڵێ پیاو ‹ئەیلۆ وەرن چاییەک بخۆنەوە!› 🇮🇷 ۱. کوچولوی دوست‌داشتنی ۲. کلمەی خواندن جمعی مرد

**ئەیلوول** / eylûl/: ناو. ئیلوول؛ مانگی نۆیەمی ساڵی هەتاوی وڵاتانی عەرەبی کە ۳۰ ڕۆژە، بەرانبەر بە مانگی زایینی سیپتامبر 🇮🇷 ایلول

**ئەینا** / eyna/: ئاوەڵکار. ئەگینا؛ دەنا 🇮🇷 اگرنە

**ئەینک** / eynik/: ☜ **ئاوێنە**

**ئەینووک** / eynûk/: ☜ **ئاوێنە**

**ئەینە**[۱] / eyne/: ئاوەڵکار. ئەوێ؛ لەو شوێنە ‹ئەینە داینێ!› 🇮🇷 آنجا

**ئەینە**[۲]: جێناو. ئەوێ؛ ئەوێنە؛ ئەو شوێنە ‹ئەینە زۆر خۆشە؛ لەیەل ئەینە بەینم نییە› 🇮🇷 آنجا

**ئەینی** / eynî/: ☜ **هەینی ـ۱**

**ئەیوان** / eywan/: ناو. هەیوان؛ سەکۆی سەرداپۆشراو ‹کۆن دەنگ تیشەی فەرهاد دیرین/ کۆن شەوق تەشاب ئەیوان شیرین «موحەمەد قولی سولەیمان»› 🇮🇷 ایوان

**ئەیە** / eye/: جێناو. یە؛ ئەمە 🇮🇷 این

**ئەیەر** / eyer/: ☜ **ئەگەر**

**ئەیەڕۆ** / eyeřo/: دەنگ. ۱. وشەی دەربڕینی نارەحەتی ‹ئەیەڕۆ خنکاوە؟› ۲. وشەی سەیرمان ‹ئەیەڕۆ خوشکێ جا تۆ شتی وا باوەڕ دەکەی؟› 🇮🇷 کلمەی بیان: ۱. تأسف ۲. تعجب

**ئەیەلۆ** / eyelo/: دەنگ. وشەی دواندنی منداڵی خشپیلانە 🇮🇷 حرف نوازش کودک

**ئەیهۆ** / eyho/: دەنگ. ئایهۆ؛ ئەیهوو؛ هەیهۆ؛ وشەی نارەزایی و وەڕەزی 🇮🇷 حرف تنفر

**ئەیهوو** / eyhû/: ☜ **ئەیهۆ**

**ئەیهووت** / eyhût/: ناو. چلەی بچووک 🇮🇷 چلە کوچک

**ئەیی**[۱] / eyî/: ئامراز. کەوابوو؛ کەوایە 🇮🇷 کە این طور

**ئەیی**[۲]: دەنگ. ۱. دەنگی دەربڕینی ئازار و ژان ۲. دەنگی دەربڕینی وەڕەزی ۳. دەنگی دەربڕینی

قیز و بێز ١. صدای اظهار درد ٢. صدای اظهار بیزاری ٣. صدای نشانەی اشمئزاز

**ئی**[1] / î/: ئاوەڵناو. یە؛ ئەم ‹ئی کارە کار زوورە یا عومەر! چەوانم کوورە یا عومەر! «فولکلۆر»› این

**ئی**[2]: ئامراز. ئێ: ١. هی؛ هین؛ وشەی مڵکایەتی ‹ئەو مالە ئی منە؛ ئی من بوو دایان بە تۆ› ٢. بەڕاستی؛ بەڕاستە ‹ـ ورچێکم گرت ـ ئی؟› ١. مالِ ٢. راستی؛ جدی

**ئی ـ**[3]: پێشگر. ئەمـ؛ یە ‹ئیرۆ؛ ئیسال؛ ئیشەڤ› امـ

**ئیار** / îyar/: ئاوەڵناو. زرینگ زرنگ

**ئیارە** / îyare/: ئاوەڵناو. پێوانە پیمانە

**ئیبلیس** / îblîs/: ناو. شەیتان شیطان

**ئیپە** / îpe/: ناو. بەنی قایشە جووت؛ بەندی قایشە نیر حلقەی چرمی کە با آن یوغ را بە خیش می‌بندند

**ئیتر** / îtir/: ئاوەڵکار. ئیدیکە؛ ئیدن ‹نابینای بێ نوور! وێت چی مەزانی؟/ ئیتر چی کەری داوای هامشانی؟! «سەیدی»› دیگر

**ئیتراک** / îtrak/: ناو. زراف؛ زەندەق؛ زالە زهره

⊡ **ئیتراک تەقین**: ئیتراک چوون؛ زراف چوون؛ زالەترەک بوون زهره‌ترک شدن

**ئیتراک چوون** ☜ **ئیتراک تەقین**

**ئیتریس** / îtrîs/: ئاوەڵناو. قیزەوون چندش‌آور

**ئیتریش** / îtrîş/: ئاوەڵکار. ئیدی؛ ئیتر دیگر هم

**ئیتوار** / îtwar/: ناو. ئیتوار: ١. متمانە؛ دڵنیایی ‹نە بە قەڵەم ئیتوار ئەکەم نە با ناخی خۆم› ٢. بڕوا ‹ئیتوار بەم چتانە ناکەم› ٣. جێگەی بڕوا؛ جێ باوەڕی ١. اطمینان ٢. اعتماد ٣. اعتبار

**ئیتۆن** / îton/: ناو. کوێر؛ شقرەشکی نابینا

**ئیتێربیوم** / îtêrb(i)yum/: ناو. توخمێ کیمیاوی کانزایی لە دەستەی لانتانیدەکان، بە ژمارەی ئەتومی ٧٠ و کێشی ئەتومی ١٧٣,٠٤ کە بە شێوەی تێکئاڵاو لەگەڵ توخمەکانی‌تر لە سروشتدا هەیە ایتربیم

**ئیتێریوم** / îtêryum/: ناو. توخمێ کیمیاوی کانزایی بە ژمارەی ئەتومی ٣٩ و کێشی ئەتومی ٨٨,٩ کە لە سروشتدا بە شێوەی تێکئاڵاو لەگەڵ بڕێک توخمی‌تردا هەیە ایتریم

**ئیجاد** / îcad/: ناو. بنیات؛ کار و ڕەوتی سازدان؛ ئاوا کردنەوە ایجاد

**ئیجار**[1] / îcar/: ناو. ئیجارە؛ کرێ؛ کرها اجارە

**ئیجار**[2]: ئاوەڵکار. ئەمجار؛ ئەم کەڕەتە این‌بار

**ئیجازە** / îcaze/: ناو. ١. ماوە؛ دەرفەت؛ وچان ٢. فتوا؛ دەستووری بەرامبەر بە شەرع ١. فُرصت ٢. فتوا

⊡ **ئیجازە دان**: هێلان؛ ڕێگا دان اجازە دادن

**ئیجازە گرتن/ وەرگرتن**: گەیشتن بە پلە و پایەی مەلایەتی و فتوا دان بە درجەی اجتهاد رسیدن

**ئیجارە**[1] / îcare/: ناو. ئیجار؛ کرێ؛ کرها اجارە

**ئیجارە**[2]: ئاوەڵکار. ئەمجار؛ ئەم کەڕەتە این‌بار

**ئیجازەدراو** / îcazed(i)raw/: ئاوەڵناو. مەرەخەس؛ ڕێگەدراو بۆ کارێ دەیکا مُجاز

**ئیجازەنامە** / îcazename/: ناو. جەواز؛ شەهادە جواز

**ئیجبار**[1] / îcbar/: ناو. زۆر؛ خورتی؛ ناچاری ‹بە ئیجبار ناردمی› اجبار

**ئیجبار**[2]: ئاوەڵناو. ناچار؛ ناعیلاج؛ مەجبوور ‹ئاغا ئیجباری کردم نان بخۆم› مجبور

**ئیجباری**[1] / îcbarî/: ناو. سەربازی؛ خزمەتی بەزۆری بۆ هێزی چەکداری وڵات سربازی

**ئیجباری**[2]: ئاوەڵناو. بەزۆری؛ زۆرەکی؛ بەخورتی ‹کاری ئیجباری› اجباری

**ئیحتیات** / îht(i)yat/: ناو. ١. پارێز؛ خۆپارێزی ‹دەچییە چیا لە مار ئیحتیاتت هەبێ!› ٢. کارقایمی ‹پیاوێکی خاوەن ئیحتیاتە› ١. احتیاط ٢.

مُحکم‌کاری

**ئیحتیاج** / îĥt(i)yac/: ناو. ئاتاجی؛ چاولەدەستی؛ نیاز ◄ احتیاج

**ئیحتیمال** / îĥtîmal/: ناو. گاهەسی؛ دۆخی ویچوون؛ گومانی نزیک لە ڕاست کە هێشتا نەسەلماوە ‹ئیحتیمالی هەیە بە ماڵەوە بچمە شار› ◄ احتمال

**ئیحرام** / îĥram/: ناو. خاولی و فۆتەی حاجیان کە لە وەختی حەج کردندا بە خۆیانەوە دەگرن ◄ احرام

**ئیحیا** / îĥya/: ناو. ١. ڕەوتی بووژاندنەوە؛ گەشاندنەوە؛ ژیاندنەوە؛ زیندووکردنەوە؛ گەشە پێ دانەوە ‹بەو یارمەتییەت ئیحیات کردمەوە› ٢. ئاوەدان کردنەوە ‹ئەم مەزرایە خۆم ئیحیام کردۆتەوە› ◄ ١و٢. احیا

**ئیخ** / îx/: ناو. ڕەوتی چۆک دادانی وشتر ◄ عمل نشاندن شتر

⊡ **ئیخ دان**: چۆک پێ دادان و خەواندنی وشتر. هەروەها: **ئیخ خواردن** ◄ خواباندن شتر

**ئیختیار**[1] / îxt(i)yar/: ناو. دەرەتان؛ بەوار؛ سەربەستی لە کاردا ◄ اختیار

**ئیختیار**[2]: ناو‌ـناو. ییختار؛ زۆرهان؛ پیر و کۆنەساڵ ‹سەلامون‌عەلەیک مامەی ئیختیار/ عەلەیکەسەلام کیژۆلەی نازدار «قانع»› ◄ سالخورده

**ئیختیاری** / îxt(i)yarî/: ناو. پیرێتی؛ پیری ◄ کهولت؛ پیری

**ئیختیدار** / îxtîdar/: ناو. ١. توانایی لە ماڵ یان لە هێزی لەشدا ‹ئێستا هەژارم ئەز، بێ ئیختیدارم ئەز› ٢. دەسەلات ‹کاکە خۆ من ئیختیداری دەوڵەتم نییە، چم پێ دەکرێ؟› ◄ ١. توانایی (مالی و بدنی) ٢. اقتدار

**ئیخلاس** / îxlas/: ناو. دڵپاکی؛ بێ‌خەوشی ‹بە ئیخلاس کار دەکا؛ بۆمان بە ئیخلاسە› ◄ اخلاص

**ئیخە** / îxe/: ناو. بەرۆک؛ یەخە ◄ یقه

**ئیدارە** / îdare/: ناو. ١. مەزرینگە؛ دەزگای دەوڵەت ٢. کاری باش بەڕێوە بردن ◄ ١و٢. اداره

**ئیداری** / îdarî/: ناو‌ـناو. کارگێری؛ سەر بە فەرمانگە ◄ اداری

**ئیدرۆژێن** / îdrojên/: ☜ **هیدرۆژن**

**ئیدی**[1] / îdî/: ناو‌ـکار. ئیدیکە؛ ئیتر: ١. جارێکی‌تر ‹ئیدی نایەمە ماڵتان› ٢. هیتر؛ هی دیکە؛ ئیتریش ‹ئەوەی دیتم باشە، ئیدیت هەیە؟› ◄ ١. بار دیگر ٢. دیگر هم

**ئیدی**[2]: ئامراز. ئیدیکە؛ ئیتر: ١. وشەی بەرهەڵستی لە هەڵس‌وکەوتێکدا ‹لێگەڕێ ئیدی؛ ئیدی با بەس بێ!› ٢. وشەی ناوازە ‹ئەمە ئیدی گاڵتە نییە!› ◄ ١و٢. دیگر

**ئیدیتۆر** / îdîtor/: ناو. نڤیسیار؛ نویسیار ◄ ویراستار

**ئیدیکە** / îdîke/: ☜ **ئیدی**

**ئیراد** / îrad/: ناو. خەوش؛ عەیب ◄ ایراد

**ئیرادگر** / îradgir/: ناو‌ـناو. عەیب‌گر؛ لێ‌گر ◄ عیبجو

**ئیرادە** / îrade/: ناو. ڤەسنا؛ خواست ◄ اراده

**ئیربار** / îrbar/: ناو. دەفر؛ هەوڕ؛ قاپ و قاچاغی ناوماڵ ◄ ظرف

**ئیربارکەر** / îrbarker/: ☜ **ئیربارگەر**

**ئیربارگەر** / îrbarger/: ناو. ئیربارکەر؛ گۆزەکەر؛ هەوڕگەر؛ کاسەکەر؛ قەواق ◄ کوزه‌گر

**ئیربیوم** / îrbyum/: ناو. ئیربیوم؛ توخمی کیمیاوی کانزایی لە دەستەی لانتانیدەکان بە ژمارەی ئەتومی ٦٨ و کێشی ئەتومی ١٦٧,٢٦ ◄ اربیم

**ئیرڤست** / îrvist/: ☜ **ئێرڤست**

**ئیرنگە** / îringe/: ناو‌ـکار. ئیرەنگە؛ ئیرهنگە؛ ئێستا؛ هەنووکە؛ نهۆ ◄ اکنون

**ئیرۆ**[1] / îro/: ناو. ئەمڕۆ؛ ئیمڕۆ ‹ئیرۆ گەرمە› ◄ امروز

**ئیرۆ**[٢]: ئاوەڵکار. ئەمڕۆ؛ ئیمڕۆ ‹ئیرۆ درەنـگ ژ خـەو ڕابوو› 🇮🇷 امروز

**ئیرووکانە** / îrûkane/: ئاوەڵکار. ئێرەکانە؛ هەر ئێرە 🇮🇷 همین جا

**ئیرووکە** / îrûke/: ئاوەڵکار. ئـیرە؛ ئـەیرە؛ ئێگـە 🇮🇷 این‌جا

**ئیرە** / îre/: ☜ ئیرووکە

**ئیرەقە** / îreqe/: ناو. ئاموور 🇮🇷 خیش

**ئیرەک** / îrek/: نـاو. غـیرەت؛ بـوێری؛ زات ‹بـێ ئیرەک ژ خوە دینێ تشت فام ناکە «پەند»› 🇮🇷 غیرت

**ئیرەنگە** / îrenge/: ☜ ئیرنگە

**ئیریدیوم** / îrîdyum/: ناو. توخمی کیمیاوی کـانزا بە ژمارەی ئەتومی ٧٧ و کێشی ئەتومی ١٩٢,٢٢ 🇮🇷 ایریدیم

**ئیڕمان** / îřman/: ناو. نۆکەر؛ بەردەست 🇮🇷 نوکر

**ئیڕۆهە** / îřohe/: ئاوەڵناو. ئێڕۆهـە؛ ئەمڕۆکـە؛ لـەم سەردەمەدا 🇮🇷 امروزه

**ئیزا** / îza/: ناو. پاداش؛ قەرەبوو؛ ڕێزانە 🇮🇷 پاداش

**ئیزبار** / îzbar/: ئاوەڵـناو. ڕووبـەڕوو؛ بەرامبـەر 🇮🇷 مُقابل

**ئیزدەرم** / îzderim/: ☜ ئیزدەرەم

**ئیـزدەرەم** / îzderem/: ئاوەڵـکار. ئیسـ‍ـ‍ـدەرەم؛ ئیستەرەم؛ ئیزدەرم؛ ئێزدەرەم؛ بێ‌گومان؛ بێ‌سـۆ 🇮🇷 حتماً

**ئیزراییـل** / îzrayîl/: نـاو. پێمێـ‍ـرد؛ پێمـ‍ـەردە؛ گیانکەنکە؛ مەڵکەمووت؛ مەلکەلمـەوت؛ گـۆنگیر؛ پێشبرد؛ گیان‌بەر؛ گیان‌کـێش؛ فریشـتەی گیـان کێشان 🇮🇷 عزرائیل

**ئیزرەم** / îzrem/: ناو. کێشانەیەکە بەرانبەر بە نیـو کیلۆ 🇮🇷 واحد جرم برابر ٥٠٠ گرم

**ئیزگا** / îzga/: ناو. محەتە؛ محەتتە 🇮🇷 ایستگاه

**ئیزن** / îz(i)n/: ناو. بەرایی؛ ئیجازە ‹داخ پەی تـۆ چ تەور بێ‌ڕەحمی کریان/ ئێلات پەی ئێلاخ باز ئیـزنش دریان «مەولەوی»› 🇮🇷 اجازه

**ئیزنگ** / îzing/: ناو. زەنگ؛ داری سووتان 🇮🇷 هیزم

**ئیزۆک** / îzok/: ناو. زیپکەی شیری دەم و چـاوی منداڵ 🇮🇷 جوش صورت نوزاد

**ئیـزەدی** / îzedî/: نـاو. ئێزیـدی؛ ئێـزدی؛ یـەزدی؛ یەزیدی؛ داسنی: ١. لقێکی ئایینی لە کوردستان کە داب و نەریتی تایبەتی خۆیان هەیە و لـە لای غەوارەوە نایدرکێنن. ئەوەندە دیارە کە ئەو ئایینە تێکەڵێک لە ئایینەکانی پـێش خۆیـە و مەلـەک تاوسیان لا پیرۆزە ٢. هـەر یەکـە لـە هـۆگران و شۆنەڕایانی ئەو ئایینە 🇮🇷 ١و٢. ایزدی

**ئیژگڵ** / îjgił/: ناو. پۆلوو؛ پەرەنگ؛ سکڵ 🇮🇷 اخگر

**ئیژنـ‍ـارەی** / îjnarey/: چـ‍ـاوگ. هەڵاژانـ‍ـ‍ـ‍ـدن؛ ڕاکشاندن 🇮🇷 دراز کردن؛ یازیدن

**ئیژیایەرە** / îjyayere/: چاوگ. هەڵاژان؛ ڕاکشـان 🇮🇷 دراز کشیدن

**ئیسا**[١] / îsa/: ناو. ئێستا؛ ئیسە؛ نووکـە؛ نهـۆ ‹ئیسـا کاتێکی باشە› 🇮🇷 اکنون

**ئیسا**[٢]: ئاوەڵکار. ئێستا؛ ئیسـە؛ نووکـە؛ نهـۆ ‹ئیسـا ڕۆیی› 🇮🇷 اکنون

**ئیساکە** / îsake/: ئاوەڵکار. ئیسـتاکە؛ هـەر ئێسـتە ‹ئیساکە هات› 🇮🇷 هم‌اکنون

**ئیساکێ** / îsakê/: ئاوەڵکار. ئیساکە؛ هەر ئیسـە 🇮🇷 هم‌اکنون

**ئیسال** / îsal/: ☜ ئەمساڵ

**ئیساڵ** / îsał/: ☜ ئەمساڵ

**ئیسـان** / îsan/: چاوگ. داگیرسـان؛ گـڕ گـرتن 🇮🇷 سوختن

**ئیسـ‍ـاندن** / îsandin/: چـ‍ـاوگ. داگیرسـ‍ـ‍ـ‍ـاندن؛ هەڵکردن ‹شاهی جەڤین غـەم ژی ڕەڤـین/ مـاری شەڤین ئیساند ئەڤین «مەلای جزیری»› 🇮🇷 افروختن

**ئیساولا** / îsawla/: ئاوەڵکار. لەمەولا؛ لە ئێستا بـە دواوە 🇮🇷 از این به بعد

**ئیستا** / îsta/: ☜ ئێستا

**ئیستاکە** / îstake/: ☜ ئێستاکە

**ئیستر** / îstir/: ☜ هێستر

**ئیستعارە** / îst(i)'are/: ناو. دەستەوا؛ خوازە ☰ استعاره

**ئیستک** / îstik/: ☜ ئێسك

**ئیستە** / îste/: ☜ ئێستا

**ئیستەرەم** / îsterem/: ☜ ئیزدەرەم

**ئیستەکونێ** / îstekûnê/: ☜ ئێستاکە

**ئیستەکێ** / îstekê/: ☜ ئێستاکە

**ئیستیعمار** / îstî'mar/: ناو. ١. داگیرکاری؛ کار و ڕەوتی دەست بە سەردا گرتنی هەرد و بوومێک لە لایەن هێزی بێگانەوە بۆ کەڵک وەرگرتن لە سەرچاوەگەلی هەمەلایەنەی ئەو وڵاتە ٢. ئاوەدانکاری ☰ ١. استعمار ٢. عُمران

**ئیستیکان** / îstîkan/: ناو. ستەکان؛ ئیسکان؛ ئسکام؛ پیاڵە؛ پەرداخی چا خواردنەوە ☰ استکان

**ئیستێ** / îstê/: ☜ ئێستا

**ئیسخوان** / îsx(i)wan/: ☜ ئێسك

**ئیسدەرەم** / îsderem/: ☜ ئیزدەرەم

**ئیسر** / îsr/: ناو. گوشینگە؛ شوێنی گووشینی ترێ و میوەی‌تر ☰ عصّاری

**ئیسراحەت** / îsraĥet/: ناو. وچان؛ پشوو ☰ استراحت

**ئیسفاڵت** / îsfałt/: ناو. قیرتاو؛ یاساغ؛ تێکەڵاوێک لە قیر و زیخ کە بۆ داپۆشانی ڕێگاوبان بە کار دێ ☰ آسفالت

**ئیسفەنج** / îsfenc/: ناو. هەور؛ کەرەور ☰ اسفنج

**ئیسقان** / îsqan/: ☜ ئێسك

**ئیسقایی**[1] / îsqayî/: ناو. ئاڤزەلێلک؛ تینشکی؛ ئاوبەند؛ زکەماسێ؛ ئیسقایی؛ نەخۆشی زگ ئاوسان ☰ استسقا

**ئیسقایی**[2]: ئاوەڵناو. تووشیاری نەخۆشی ئیسقا ☰ مبتلا به استسقا

**ئیسک** / îsk/: ☜ ئیسکە

**ئیسکاج** / îskac/: ناو. کاسەشۆر؛ دەفرشۆر؛ پەڕپەژمینە؛ زروە؛ پەڕۆ زروە ☰ اسکاچ

**ئیسکان** / îskan/: ☜ ئیستیکان

**ئیسکۆتک** / îskotik/: ناو. بەرەنیسکێ؛ هەنیسکی گریان ‹ئیسکۆتک تینە من› ☰ سکسکەی گریه

**ئیسکە** / îske/: ناو. ئیسک؛ نزگەرە؛ نزیرە ☰ سکسکه

**ئیسکی** / îskî/: ناو. خلیسکانێ؛ خلیسکێن؛ خسکێ؛ خلیسکێ؛ خلووزگێ؛ خشخشان؛ خزخزان؛ وەرزشی خز خواردن بە سەر بەفردا ☰ اسکی

**ئیسلام** / îslam/: ناو. ١. دینی گەورەی یەکتاپەرستی کە لە لایەن حەزرەتی موحەممەد کوڕی عەبدوڵلاوە، ١٤ چەرخی پێش هاتە ئاراوە ٢. موسوڵمان؛ بسڵمان ‹با شەو بڕوا سەحەر بێ، باغی گوڵان وە بەر بێ/ گەر تۆ مەیلت لە سەر بێ، کافر ئیسلامی ناوە «وەفایی»› ☰ ١. اسلام ٢. مُسلمان

**ئیسلامەتی** / îslametî/: ناو. موسوڵمانی؛ ئیسلام ☰ مُسلمانی

**ئیسلامی** / îslamî/: ناو. ١. پێوەندیدار یان سەر بە ئیسلامەوە ٢. موسڵمان؛ شوێنکەوتووی ئەو ئایینە ☰ ١و٢. اسلامی

**ئیسۆت** / îsot/: ناو. ئیسیوەت؛ فلفل؛ بیباری ڕەش ☰ فلفل سیاه

**ئیسە** / îse/: ☜ ئێستا

**ئیسیوەت** / îsîwet/: ☜ ئیسۆت

**ئیش**[1] / îş/: ناو. ١. کار و فرمان ‹ئیش کە رووی ئێستە لە هەورازە سەرەو لێژی نەکەی/ بیری دووریشی دەوێ هەر بە دۆعا و نوێژی نەکەی «شوکری فەزلی»› ٢. ئیشت؛ زللە لە پاش مل ☰ ١. کار ٢. پس‌گردنی

**ئیش**[2]: دەنگ. قخ؛ پیسە؛ وشەی پارێز لە پیسی ☰

کلمەی تحذیر از کثافت

**ئیشار / îşar/**: ناو. چارۆکە؛ کۆلـوانە؛ جۆرێ سەرپۆشی ژنانە کە شان و پیل دەگرێ ☰ نوعی ردای زنانە

**ئیشارەت / îşaret/**: ناو. هێما؛ ئاماژە ☰ اشارە

**ئیشت / îşt/**: ناو. عیشت؛ شەپەزلەی پشتەمل ☰ پس‌گردنی

**ئیشتیا / îşt(i)ya/**: ناو. واز؛ کەیف؛ ئارەزوو؛ هەوەس ☰ اشتها

⊡ **ئیشتیا بزوتن**: هەوەسی جنسی هەستان ☰ هوس جنسی کردن

**ئیشتیا بەستران**: ئیشتیا نەمان؛ مەیل نەمان بۆ خواردن بە هۆی خەفەتێکەوە ☰ پُرخوری کردن

**ئیشتیا پەڕینە/ چونە سەر**: حەز کردن لە کەسێک ☰ خاطرخواه کسی شدن

**ئیشتیا کرانەوە**: زۆر خواردن ‹ئیشتیای کراوەتەوە تێر ناخوا› ☰ پُرخوری کردن

**ئیشتیا کردن**: ئارەزوو کردن؛ دڵ چوونە سەر ☰ اشتها کردن

**ئیشتیا کوێر بونەوە**: ئیشتیا نەمان؛ بەسەر چوونی مەیلی خواردن ☰ اشتها کور شدن

**ئیشتیا لێ بون**: حەز پێ کردن؛ دڵ چوونە سەر ☰ میل داشتن

**ئیشتیا نەبردن**: دڵ نەچوونە سەر؛ دڵ نەبردن ☰ میل نداشتن

**ئیشتیا هەڵسان**: واز چوونە سەر ☰ هوس کردن

**ئیشق / îşq/**: ☞ **عیشق**

**ئیشقلکێ / îşqilkê/**: ناو. هەنگلەشەلە؛ کاری لە سەر یەک پا ڕۆیشتن ☰ لی ـ لی

**ئیشک / îşk/**: ئاوەڵناو. ١. ☞ **وشک** ٢. ڕەق؛ سەخت ☰ ١. ☞ **وشك** ٢. سخت

⊡ **ئیشک بون**: ١. لە تەڕی قوتار بوون ٢. لە شوێنێ قەتیس بوون ٣. *[مەجاز]* سەیرمان یا لەپڕ هەست بە خەفەتێکی زۆر کردن ‹کە وای گوت هەر لە جێی خۆم ئیشک بووم› ☰ ١و٢. خُشک شدن ٣. خِشک زدن

**ئیشک کردن**: ١. لە تەڕی ڕزگار کردن ٢. لە شیردان وەستان ☰ ١. خُشک کردن ٢. خُشک شدن شیر

**ئیشک کردنەوە**: لە تەڕی خەلاس کردن ☰ خُشک کردن

**ئیشک هەڵاتن**: ١. وشکەوە بوون ٢. *[مەجاز]* لە خەم و خەفەتان یا نەخۆشی، کز و لاواز بوون ☰ ١. خُشک شدن ٢. زرد و ضعیف شدن

**ئیشک هەڵگەڕان**: وشک هەڵاتن؛ تەڕی تێدا نەمان ☰ خُشک شدن

**ئیشک هەڵێنان**: ١. وشک کردنەوە ٢. *[مەجاز]* خەم دان بە کەسێک و لاواز کردنی ☰ ١. خُشک کردن ٢. غصەدار کردن

**ئیشکارۆ / îşkaro/**: ☞ **وشکارۆ**

**ئیشکانی / îşkanî/**: ☞ **وشکایی**

**ئیشکاو / îşkaw/**: ☞ **وشکاو**

⊡ **ئیشکاو داهاتن**: نمتک بوون؛ هیچ نم و تەڕایی تێدا نەمان ☰ کاملاً خشک شدن

**ئیشکاو هاتن**: ١. *[مەجاز]* تووشی تینوایەتی لەڕادەبەدەر بوون ‹ئیشکاوم هاتێ بۆ قومێک ئاو› ٢. تەواو بوونی ئاوی شوێنێ ٣. تەواو بوون؛ کۆتایی هاتن ☰ ١. دچار تشنگی شدید شدن ٢. خُشکیدن ٣. تمام شدن

**ئیشکاوز[١] / îşkawiz/**: ناو. ئیشکاوس؛ خەفتان؛ تۆی بە وشکییەوە کراو ☰ کاشت پیش از باران

**ئیشکاوز[٢]**: ☞ **وشکاوس**

**ئیشکاوس[١] / îşkawis/**: ☞ **ئیشکاوز[١]**

**ئیشکاوس[٢]**: ☞ **وشکاوس**

**ئیشکایی / îşkayî/**: ناو. وشکانی؛ ئیشکانی ☰ خُشکی

**ئیشك‌وبرینگ** / îşk û b(i)rîng/: ☜ **وشك‌وبرینگ**

**ئیشكه** / îşke/: ناو. ١. كۆن‌دۆ؛ ئیشكه‌دۆ؛ ئێشكه‌دۆ؛ ئاژه‌ڵێ كه نه‌زابێ و شیر بدا ٢. پاره‌ی نه‌غد له‌ ماڵدا ▤ ١. دامی كه نزاییده شیر دهد ٢. نقدینه

**ئیشكه‌بار** / îşkebar/: ☜ **وشكه‌بار**

**ئیشكه‌به‌رد** / îşkeberd/: ☜ **وشكه‌كه‌ڵه‌ك**

**ئیشكه‌به‌ند** / îşkebend/: ناو. سایه‌قه‌ و سه‌رمای سه‌ختی بێ‌به‌فر و باران ▤ سوز و سرمای خُشك

**ئیشكه‌بیرۆ** / îşkebîro/: ناو. بیرۆی وشك؛ وشكه‌بیرۆ ▤ اگزمای خُشك

**ئیشكه‌پلاو** / îşkep(i)ław/: ☜ **وشكه‌پلاو**

**ئیشكه‌په‌ڕ** / îşkepeř/: ناو. چۆنیه‌تی ڕه‌حه‌ت بوونی بێ سه‌رجێی ▤ فرایند ارضا شدن

**ئیشكه‌جو** / îşkecû/: ☜ **وشكه‌جاو**

**ئیشكه‌چن** / îşkeçin/: ☜ **وشكه‌كه‌ڵه‌ك**

**ئیشكه‌چۆم** / îşkeçom/: ☜ **وشكه‌چۆم**

**ئیشكه‌داوه‌ت** / îşkedawet/: ☜ **وشكه‌داوه‌ت**

**ئیشكه‌دۆ** / îşkedo/: ☜ **ئیشكه ـ١**

**ئیشكه‌ر** / îşker/: ناو. كاركه‌ر؛ ئه‌و كه‌سه‌ی كار ده‌كا ‹چابوك و بێ‌فێز و ئیشكه‌ر، كاسبێكی بێ‌ده‌مار/ دوژمنی قڕ كا به‌ نركه‌ هه‌ر وه‌كوو شێری شكار «قانع»› ▤ كارگر

**ئیشكه‌ڕن** / îşkeřin/: ☜ **وشكه‌ڕن**

**ئیشكه‌ڕۆ** / îşkeřo/: ناوه‌ڵناو. ١. فێره‌ ڕه‌وت نه‌كراو (ئه‌سپ) ٢. تایبه‌تمه‌ندی چۆمێ كه‌ هاوین وشك ده‌كا ▤ ١. تعلیم‌ندیده (اسب) ٢. فصلی (جوی)

**ئیشكه‌ڕێ** / îşkeřê/: ☜ **وشكه‌ڕێ**

**ئیشكه‌ژان** / îşkejan/: ناو. ژانه‌ زگی بێ‌زگ‌چوون و ڕشانه‌وه ▤ شكم‌درد بدون اسهال و استفراغ

**ئیشكه‌ساڵ** / îşkesał/: ☜ **وشكه‌ساڵ**

**ئیشكه‌سۆفی** / îşkesofî/: ☜ **وشكه‌سۆفی**

**ئیشكه‌سه‌رما** / îşkeserma/: ☜ **وشكه‌سه‌رما**

**ئیشكه‌سه‌ما** / îşkesema/: ☜ **وشكه‌سه‌ما**

**ئیشكه‌شیو** / îşkeşîw/: ☜ **وشكه‌شیو**

**ئیشكه‌كه‌ڵه‌ك** / îşkekełek/: ☜ **وشكه‌كه‌ڵه‌ك**

**ئیشكه‌كه‌ند** / îşkekend/: ☜ **وشكه‌كه‌ند**

**ئیشكه‌ڵ** / îşkeł/: ناو. چڕ و چیلكه؛ وشكه‌ لق و چرۆ كه‌ بۆ سووتان ده‌بێ ▤ هیمه

**ئیشكه‌ڵوا** / îşkełwa/: ناو. هه‌ڵوای دۆشاو كه‌ بۆ سه‌فه‌ری ده‌به‌ن ▤ حلوای سفری

**ئیشكه‌مز** / îşkemiz/: ☜ **وشكه‌مز**

**ئیشكه‌مس** / îşkemis/: ☜ **وشكه‌مز**

**ئیشكه‌وه‌بو** / îşkewebû/: ناوه‌ڵناو. وشك هه‌ڵاتوو؛ وشكه‌وه‌بوو؛ وشكه‌ڵاتوو ▤ خُشكیده

**ئیشكه‌وه‌رد** / îşkewerd/: ناو. خه‌فتان؛ وشكه‌كێڵ ▤ شخم در زمین خشك

**ئیشكێڵ** / îşkêł/: ناو. ١. زمانه‌؛ لاولاوی دارین؛ پارچه‌ ته‌خته‌ی سێ سووچی قایم كردنی په‌نجه‌ره ٢. شه‌یتانۆكه؛ سه‌ده‌فۆكه‌یه‌كی سپی وه‌ك گوێ ماسیلكه، به‌هاران پاش باران ده‌زێته‌وه ▤ ١. چوبک قفل پنجره ٢. حلزون

**ئیشلك** / îşlik/: ناو. كورته‌ك؛ كورته؛ جۆرێ كه‌وا ▤ نوعی قبای مردانه

**ئیشله‌ك** / îşlek/: ناو. سوخمه؛ یه‌له‌ك ▤ یلَک

**ئیشه‌ڤ**[1] / îşev/: ناو. ئه‌مشه‌و؛ ئیمشه‌و ▤ امشب

**ئیشه‌ڤ**[2]: ناوه‌ڵكار. ئه‌مشه‌و ‹ئیشه‌ڤ وه‌ره‌ ماڵا مه‌› ▤ امشب

**ئیشه‌ڵلا** / îşełła/: نزا. ئه‌گه‌ر خودا مه‌یلی لێ بێ ‹عاجز مه‌به‌ بێخود كه‌ ئیشه‌ڵلا وه‌كوو یه‌عقووب/ نه‌زدیكه‌ ویسالی مه‌هی كه‌نعانی كووه‌یتم «بێخود»› ▤ ان‌شاءالله

**ئیعان** / î'an/: ناو/ ناوه‌ڵكار. ئێسته؛ ئیسه؛ ئێستاكه ▤ اكنون

**ئیعانه** / î'ane/: ناو. ئانه؛ باربوو؛ یارمه‌تی ▤ اعانه

**ئیعتیبار** / î'tîbar/: ناو. بڕ؛ وه‌ج؛ دۆخی جێ‌باوه‌ڕ بوون ▤ اعتبار

**ئیعدام / îʿdam/**: ناو. کاری کوشتنی کەسێک بە حوکم ☰ اعدام

**ئیغدام / îğdam/**: ناو. بوێری؛ غیرەت ☰ شُجاعت

**ئیف١ / îf/**: ناو. فیێ؛ نەخۆشی خووداری ☰ صرع

**ئیف٢**: دەنگ. بەهۆ؛ ئای چ باشە ☰ بە ـ بە

**ئیفادە / îfade/**: ناو. فیز؛ دەعیە؛ دەمار ☰ افادە

**ئیفلیج / îflîc/**: ئاوەڵناو. کەمئەندام؛ گۆچ؛ گـۆت ☰ افلیج

**ئیفلیجی / îflîcî/**: ناو. دەملە؛ شەلەل؛ فالنج؛ قرۆپ؛ کوچی ☰ فلجی

**ئیقل / îqil/**: ئاوەڵکار. هەر ئەوەندە؛ هەر ئەو تـۆزە ☰ همین یک ذرّە

**ئیکلام / îklam/**: نـاو. کـڕنۆش؛ کوڕنـۆ؛ کـاری داهاتنەوە و سەر دانەواندن بە نیشانەی ڕێزگـرتن ☰ تعظیم

⊡ **ئیکلام کردن**: ئیکلام کێشان؛ کڕنۆش کـردن ☰ تعظیم کردن

**ئیکلام کێشان**: ☜ **ئیکلام کردن**

**ئیکـو / îkû/**: ئاوەڵـکار. چـۆن؛ چلـۆن؛ چـاوا ‹ئیکووی؟› ☰ چطور

**ئیکە١ / îke/**: ئاوەڵناو. ئیدیکە ‹کاری ئیکە› ☰ دیگر

**ئیکە٢**: جێناو. هیتر؛ یادن؛ ئیدیکە ‹ئـەم دێ و ئیکـە دەڕوا› ☰ دیگری

**ئیگدی / îg(i)dî/**: ☜ **ئیگدێ**

**ئیگدێ / îg(i)dê/**: ناو. ئیگدی؛ سرینچک؛ سـنجوو ☰ سنجد

**ئیگرەم / îgrem/**: نـاو. کێشـانەیەک بەرانبـەر بـە ٢٠٠ گرەم ☰ واحد وزنی معادل ٢٠٠ گرم

**ئیگزیستانسیالیسم/ îgzîstans(i)yalîsm/**: ئاوەڵناو. لە مەکتەبـە ناودارەکـانی چـەرخی بیسـتەم لـە ڕۆژئاوادا کە بڕوای لە سەر ئەوەیە مـرۆ بـۆ خـۆی چۆنـاوچۆنی ژیـان و هەڵـسوکـەوتی ژیـن دەنەخشێنێ ☰ اگزیستانسیالیسم

**ئیگل / îgil/**: ئاوەڵکار. ئەمجارە؛ جارێکی‌تر ☰ این بار

**ئیلاقە / îlaqe/**: نـاو. ١. پەیوەنـدی؛ ئاشـنایی ٢. دەسدرێژی جینسی ☰ ١. علاقه و پیوند ٢. تجـاوز جنسی

**ئیلاقەکەر / îlaqeker/**: ناو. *[ناشیرین]* گانکەر؛ گایەر؛ کەسێ کە گان دەکا ☰ جماع کننده

**ئیلان / îlan/**: ☜ **ئیلیان**

**ئیللا١ / îlla/**: ناو. دۆخی لـە سـەر پشـت کـەوتنی میچ ☰ حالت بر پشت افتادن شتالنگ

**ئیللا٢**: ئامراز. ١. جگە؛ بل ‹عیشقت کە مەجازی بێ، خواهیش مەکە ئیللا کچ!/ شیرین کچ و لـەیلا کـچ و سەلما کچ و عەزرا کـچ «نـالی»› ٢. وشـەی سـوور بوون و پێ داگرتن ‹کەڵکی نەگرت تکای ڕنجـدەر/ بەر شەقیان دا دەستەی نۆکەر: ئیللا گێزەر ... ئـیللا گێزەر ... «گۆران»› ☰ ١. الا؛ بجز ٢. حرف ابرام

**ئیللان و بیللان / îllan û bîllan/**: ☜ **ئیللا و بیللا**

**ئـیللا و بـیللا / îllawbîlla/**: ئاوەڵـکار. ئـیللان و بیللان؛ وشەی پێداگری و سوور بوون ☰ الاّ و بلاّ

**ئیلمە / îlme/**: ناو. گرێ ☰ گره

**ئیلول / îlûl/**: ☜ **ئەیلول**

**ئیلیان / îlyan/**: ناو. ئیلان؛ هێلان؛ هێلین؛ هێلانە؛ ماڵی مەل ☰ آشیانه

**ئیم١ / îm/**: نـاو. ئێم؛ ئالێـک؛ کـا و جـۆ؛ پێخـۆری ئاژەڵان ☰ علیق ستور

**ئیم ـ٢**: پێشگر. ئەم ـ ؛ ـ ئەو ‹ئیمڕۆ؛ ئیمساڵ› ☰ امـ

**ئیما / îma/**: ناو. هێما ☰ اشاره

**ئیمالە / îmale/**: ناو. دەسـتوور؛ عیمالـە؛ حوقنـە؛ ئامرازی تێڕۆ کردنی تراوی زگشۆرەوە بـۆ نـاوزک ☰ اماله

**ئیمام / îmam/**: ناو. ١. *[فیقه]* پێشەوای ئـایینی ٢. پێش‌نوێژ ٣. ☜ **ئیمامیە** ☰ ١. امام ٢. پیش‌نماز ٣. ☜ **ئیمامیه**

**ئیمامه** / îmame/: ناو. ئیمام؛ سۆفیله؛ دەنکه هەره درێژەکەی تەزبێح ☰ درشت‌ترین دانەی تسبیح

**ئیمامەتی** / îmametî/: ناو. پێش‌نوێژی؛ بەرنوێژی ☰ پیش‌نمازی

**ئیمامییە** / îmamîye/: ناو. ئیمام: ١. شیعە؛ شێعە ٢. ئەوانەی لە سەر ئەو بڕوایەن کە پێویستە ئیمامێک ڕێبەری موسوڵمانان بێ ☰ ١و٢. امامیه

**ئیمان** / îman/: ناو. بڕوا؛ باوەڕی ☰ ایمان

◻ **ئیمان هەردە بوون:** لە دین دەرچوون: ١. لە دین و خوداپەرستی پەژیوان بوونەوە ٢. *[کینایە]* لەبەر تووڕەیی و وەڕەزی زۆر، عەقڵ و بیر شێوان ☰ ١. از دین برگشتن ٢. کنترل خود را از دست دادن

**ئیماندار** / îmandar/: ناو‌ئاو. خواناس ☰ خُداشناس

**ئیمان‌وشادە** / îman û şade/: ناو. شاتیمان؛ شایەتیمان ☰ شهادتین

**ئیمپراتور** / împ(i)ratûr/: ناو. قراڵ؛ شای شاهان ☰ امپراتور

**ئیمپراتوری** / împ(i)ratûrî/: ناو. ١. پلە و پاگەی ئیمپراتوور ٢. ئەو وڵاتانەی وان لە ژێر حوکمی ئیمپراتووردا ☰ ١و٢. امپراتوری

**ئیمتیاز** / îmt(i)yaz/: ناو. سەرپشکی: ١. هەڤیازی؛ دۆخی لە سەر بوون ٢. پشک؛ سەربەشی ٣. سەربەشایەتی؛ مافێک لە لایەن دەوڵەتەوە بۆ کردنی کارێ ☰ ١تا٣. امتیاز

**ئیمجا** / îmca/: ☜ ئەمجار

**ئیمجار** / îmcar/: ☜ ئەمجار

**ئیمچوون** / îmçûn/: ناو. ١. چوار پەل؛ دەس‌وپا؛ هەردوو دەست و هەردوو پا (زۆرتر بۆ حەیوان دەگوترێ) ٢. دەستێ ناڵی ئەسپ ☰ ١. چهار دست و پا ٢. یک دست نعل اسب

**ئیمڕۆ**[1] / îmřo/: ناو. ڕۆژێ کە تێیداین ‹چێشتی ئیمڕۆشمان شلەیە› ☰ امروز

**ئیمڕۆ**[2]: ئاو‌ئکار. ئەوڕۆ ‹ئیمڕۆ بەڕۆژووم› ☰ امروز

**ئیمڕۆژی** / îmřojî/: ☜ ئەمڕۆیی

**ئیمزا** / îmza/: ناو. واژۆ؛ پاراف؛ ناو یان دروشمی تایبەتی کەسێک کە بە نیشانەی چەسپاندن و پەسند کردنی نووسراوەیەک لە ژێریدا دەنووسێ ☰ امضا

**ئیمساڵ** / îmsał/: ☜ ئەمساڵ

**ئیمشەو** / îmşew/: ☜ ئەمشەو

**ئیملا** / îmla/: ناو. نژوە؛ کاری نووسینەوەی وتەی کەسی تر ☰ املا

**ئیمە** / îme/: ☜ ئێمە

**ئیمەیل** / îmeyl/: ناو. جۆرێ پۆستەی بە ئینترنێت ☰ ایمیل

**ئین** / în/: ☜ هەینی ـ١

**ئینات** / înat/: ناو. لاساری ☰ بدرفتاری

**ئینان**[1] / înan/: چاوگ. هێنان؛ ئانین؛ هاوردن ☰ آوردن

**ئینان**[2]: ناو. ئیمان؛ باوەڕ؛ متمانە ☰ باور

**ئیناندن** / înandin/: چاوگ. هێنان؛ هاوردن ☰ آوردن

**ئینترنێت** / întirnêt/: ناو. تۆڕی کەمپیوتەری نێونەتەوەیی بۆ پێوەندی و زانیاری گرتن ☰ اینترنت

**ئینجا**[1] / înca/: ئاو‌ئکار. ١. ئیمجا؛ ئەمجار ٢. جا؛ لەوە دوا ☰ ١. این‌بار ٢. سپس

**ئینجا**[2]: ئامراز. کەوایە؛ کەوابوو ☰ که این طور

**ئینجار** / încar/: ئاو‌ئکار. ئینجارەکانی؛ ئینجارەکانێ؛ ئینجارەکێ؛ ئینجاکوو؛ ئینجاکوونێ؛ ئێنجار؛ کەواتا؛ کەوابوو ‹تۆ وەرە، ئینجار قسەی خۆمان دەکەین› ☰ پس

**ئینجارەکانی** / încarekanî/: ☜ ئینجار

**ئینجارەکانێ** / încarekanê/: ☜ ئینجار

**ئینجارەکێ** / încarekê/: ☜ ئینجار

**ئینجاکوو** / încakû/: ☜ ئینجار

**ئینجاکوونێ** / încakûnê/: ☜ **ئینجار**

**ئینجانه** / încane/: ناو. گوڵدان؛ دەفری گڵین بۆ گوڵ تێدا چاندن 🇮🇷 گُلدان سفالی

**ئینجه** / înce/: ئێل. ← **ئینجەوفینجه**

**ئینجەت** / încet/: ناو. ئەنجەت؛ بیانوو؛ بەهانە 🇮🇷 بهانه

**ئینجەوفینجه** / încewfînce/: ناو. فیز و دەمار 🇮🇷 فیس و افاده

**ئینچ** / înç/: ناو. یەکەی پێوانەی درێژی لە وڵاتانی ئەنگلۆساکسۆن، بەرانبەر بە ۲٫٥٤ سانتیمیتر 🇮🇷 اینچ

**ئینـدیوم** / înd(i)yum/: ناو. توخمی کانزایی بە ژمارەی ئەتومی ٤٩ و کێشی ئەتومی ١١٤ 🇮🇷 ایندیم

**ئینساف** / însaf/: ناو. فرسەند؛ کاری ڕەوا کردن و لە ناڕەوا دوور گرتن ‹تۆ پزیشکی حاڵزان و مەن نەخۆش و دەردەدار/ چاکە ئینسافت بێ، کاتێ کە خۆم خستە پەنات «قانع»› 🇮🇷 انصاف

**ئینسان** / însan/: ناو. مرۆ؛ مرۆڤ 🇮🇷 انسان

**ئینسانەتی** / însanetî/: ناو. مرۆڤایەتی؛ جوامێری 🇮🇷 انسانیت

**ئینسانی** / însanî/: ئاوەڵناو. ۱. پێوەندیدار بە مرۆڤەوە ‹خۆراکی ئینسانی› ۲. بە تایبەتمەندی و بایەخگەلی ئینسانییەوە ‹ئەخلاقی ئینسانی› 🇮🇷 ۱و۲. انسانی

**ئینشا** / înşa/: ناو. کاری نووسین بە پەیدا کردنی وشە و ڕستەی جوان و گونجاو ‹چ وەختێ ئامای ئینشای فەردت بێ/ چ وادەی یاوای دەوای دەردت بێ «مەولەوی»› 🇮🇷 انشا

**ئینشابەند** / înşabend/: ناو. مونشی 🇮🇷 منشی

**ئینکار**[1] / înkar/: ناو. ئینکاری؛ حاشا 🇮🇷 انکار

**ئینکار**[2]: ئاوەڵناو. لاسار؛ گوێنەدەر؛ پێداگر لە سەر قسەی خۆی و بایەخ بە بیروڕای کەس نەدەر 🇮🇷 لجباز

**ئینکاری** / înkarî/: ☜ **ئینکار**[1]

**ئینکەبەری** / înkeberî/: ناو. لاساری؛ گوێنەبیسی 🇮🇷 لجبازی

**ئینه** / îne/: جێناو. ۱. ئەوانە؛ ئەمانە؛ یانە ۲. ئەمە؛ ئەم یەکە ‹ئینە چێشۆ؟› 🇮🇷 ۱. آنها ۲. این

**ئیوەت** / îwet/: ☜ **ئێوەت**

**ئیوهی** / îw(i)hî/: ناو. بکە؛ پکەی جگ؛ پشتە؛ چۆنیەتی بە ڕوودا کەوتنی میچ 🇮🇷 دمر افتادن شتالنگ

**ئیه**[1] / îye/: ئاوەڵناو. ئەمە؛ ئەیە ‹ئیە بار› 🇮🇷 این

**ئیه**[2]: جێناو. ئەمە؛ ئەیە 🇮🇷 این

**ئێ**[1] / ê/: ئاوەڵکار. ۱. نیشانەی ددان پێدا نان ‹ئەم پانتۆڵە جوانە؟ ئێ!› ۲. دەی ‹ئێ، دوایی بوو بە چی؟› ۳. ئەرێ ‹ـ دەڵێن پەڵەی داوە ـ ئێ، ڕاستە› 🇮🇷 ۱. تا حدی ۲. خُب ۳. بله

**ئێ**[2]: ئامراز. ۱. وشەی ملکایەتی ‹ئێ من بی، تە بۆ خۆ برد!› ۲. ☜ **ئی**[2] 🇮🇷 ۱. حرف تملُک ۲. ☜ **ئی**[2]

**ئێتوار** / êtwar/: ☜ **ئیتوار**

**ئێتون** / êtûn/: ☜ **هێتوون**

**ئێتیم** / êtîm/: ☜ **هەتیو**

**ئێجگار** / êcgar/: ئاوەڵکار. هێجگار؛ یەکجار؛ زێدە؛ فرە ـ فرە؛ گەلەک زۆر و زەمەند ‹ئێجگار ئێشم هەیە› 🇮🇷 بسیار

**ئێجگارەکی** / êcgarekî/: ☜ **ئێجگاری**

**ئێجگاری** / êcgarî/: ئاوەڵکار. ئێجگارەکی؛ یەکجاری؛ بە تەواوی؛ ئیتر قەت ‹ئێجگاری چوون و بەرهەڵدا بوون› 🇮🇷 به تمامی

**ئێخته** / êxte/: ☜ **ئەخته**[2]

**ئێختەرمه** / êxterme/: ناو. ۱. ئەسپی یەدەگ ۲. ئەسپ و چەکی تالانی ۳. لاشەی کوژراوی دوژمن 🇮🇷 ۱. اسب یدک ۲. اسب و اسلحەی غنیمتی ۳. جسد دشمن

**ئێخستن** / êxistin/: چاوگ. ۱. بە عەرزدا دان ۲. خستن 🇮🇷 ۱. بر زمین زدن ۲. انداختن

**ئێخسیر**[1] / êxsîr/: ناو. دیل؛ بەندی ‹وریا بە ئێخسیرەکان ئەشکەنجە نەدەن› اسیر

**ئێخسیر**[2]: ئاوەڵناو. ١. دیل؛ گراو ‹دلی ئێخسیرم لە داوی زولفت دایم‌ودەرهەم هات‌وهاوارییە «فولکلۆر»› ٢. هەژار و جێگەی بەزەیی ١. اسیر ٢. بینوا

**ئێخە** / êxe/: ناو. بەربەرۆک؛ بینگ یقه

**ئێدن** / êdin/: ئاوەڵکار. هی‌دی؛ دووبارە؛ هی‌دیکە دوباره؛ ایضاً

**ئێر** / êr/: ☜ ئاگر

**ئێرا**[1] / êra/: ئاوەڵکار. ئێرە؛ ئەم جێگە؛ لە ئێرەدا ‹ئێرا کوشتیان› اینجا

**ئێرا**[2]: جێناو. ئێرە ‹ئێرام پێ خۆشە؛ کاری ئێرا ئاسانترە› اینجا

**ئێراق** / êraq/: ناو. بەربەرۆچکە؛ شوێنی خۆرگیر آفتابگیر

**ئێرانە**[1] / êrane/: ئاوەڵکار. ئێرە؛ ئێرا؛ ڤر؛ لە ئەم شوێنە ‹خێرا هاتن و ئێرانە گرتیان› اینجا

**ئێرانە**[2]: جێناو. ئێرە؛ ئێرا؛ ڤر؛ ئەم شوێنە ‹ئێرانە دەبێ خاوێن ببێتەوە› اینجا

**ئێرسی** / êrsî/: ئاوەڵناو. ژێنێتیکی؛ میراتی؛ زکماکی مادرزادی

**ئێرڤست** / êrvist/: ناو. ئێرڤست؛ هەڤرست؛ هەڤرس؛ هەڤرسک؛ هێرڤست؛ هەڤرسک؛ هەڤریست؛ هەوریس؛ دارێکی ڕازێنەیی لە کەناری شەقام و ناو پارکەکان هەیە جۆرێکە لە داری کێکف، قەدی دارەکەی لە دارتاشی و پیشەسازیدا سوودبەخشە افرا

**ئێرمان** / êrman/: ناو. نۆکەر؛ بەردەست؛ خزمەتکار نوکر

**ئێروو** / êrû/: ناو. بژیو؛ تفاق؛ پێداویستی ماڵ ‹لە هێلانەی خزی و بێدەنگە سێروو/ دەڵێی خۆشخوانی کوردە نێتی ئێروو «هێمن»› ملزومات زندگی

**ئێرووکانە** / êrûkane/: ئاوەڵکار. هەر لێرە همین جا

**ئێرووکە** / êrûke/: ئاوەڵکار. ڕاست لێرە همین جا

**ئێرە**[1] / êre/: ناو. ئەیرە؛ ئەگرە؛ ڤر؛ شوێنێکی نزیک و ناسراو بۆ بیسەر ‹ئێرە زۆر خۆشە› اینجا

**ئێرە**[2]: ئاوەڵکار. ئەیرە؛ ئەگرە؛ ڤر؛ لەم شوێنە ‹ئێرە خۆر هەڵاتووە› اینجا

**ئێرە**[3]: جێناو. ئەیرە؛ ئەگرە؛ ڤر ‹وەرە ئێرە› اینجا

**ئێرەق**[1] / êreq/: ☜ ئێرەقە

**ئێرەق**[2]: ئاوەڵناو. ١. هێرەق؛ کێرهەستاو ‹ئەم ئەسپە لەو ماینە ئێرەق بووە› ٢. ڕەق؛ ڕەپ ‹بڕوانە ئێرەقی کردووە› ١. نعوظ کرده ٢. برآمده

**ئێرەقان** / êreqan/: ناو. زەردەیی؛ زەردوویی یرقان

**ئێرەقە** / êreqe/: ناو. ئێرەق؛ هەوجاڕی یەکپارچە کە دەندە و باسک پێکەوەن خیش

**ئێرەکانە** / êrekane/: جێناو. ئێرە؛ ئەیرە ‹ئێرەکانە دامرکێ› اینجا

**ئێرەکانێ** / êrekanê/: جێناو. ئێرە؛ ئەیرە ‹وەرە ئێرەکانێ› اینجا

**ئێرەکە** / êreke/: جێناو. ئێرە همین‌جا

**ئێرەمووک** / êremûk/: ئاوەڵناو. نێرەمووک؛ نە نێر نە مێ خُنثا

**ئێرەیی**[1] / êreyî/: ناو. چاوچنۆکی؛ بەغیلی؛ حەسوودی بُخل؛ حسد

**ئێرەیی**[2]: ئاوەڵناو. خەڵکی ئێرە اهل اینجا

**ئێرەییبەر** / êreyîber/: ئاوەڵناو. دەخس؛ حەسوود؛ چاوچنۆک حسود

**ئێڕۆ** / êřo/: ☜ ئەمڕۆ

**ئێڕۆهە** / êřohe/: ☜ ئیڕۆهە

**ئێزتەیوە** / êzteywe/: چاوگ. دۆزینەوە یافتن

**ئێزدەرەم** / êzderem/: ☜ ئیزدەرەم

**ئێزدی** / êzdî/: ☜ ئیزەدی

**ئێزنگ** / êzing/: ناو. هێزم؛ داری سووتاندن هیزم

**ئێزۆک** / êzok/: ناو. زیپکەی شیری کە لە دەم و چاوی منداڵان دێت 🇮🇷 جوش شیری

**ئێزی** / êzî/: ناو. جۆلانەی گوریسی منالان 🇮🇷 تاب

**ئێزیایۆ** / êzyayo/: چاوگ. دۆزرانەوە 🇮🇷 پیدا شدن

**ئێزیدی** / êzîdî/: ☜ **ئیزەدی**

**ئێزینگ** / êzîng/: ناو. ئێزنگ؛ زەنگ؛ کەڵەدار؛ بڕەدار؛ هێزم 🇮🇷 هیزُم

**ئێژای** / êjay/: چاوگ. هێژان؛ تیەرزین 🇮🇷 ارزیدن

**ئێژنەفتن** / êjneftin/: چاوگ. ژنەوتن؛ شنەفتن 🇮🇷 شنیدن

**ئێژی** / êjî/: ☜ **ئەیژی**

**ئێستا**[1] / êsta/: ناو. ئیستا؛ ئیستە؛ ئێستە؛ ئیستێ؛ ئیسە؛ ئێستێ؛ ئانکا؛ ئانوها؛ ئانۆکا؛ نهۆ؛ نووکە ‹ئێستا نیوەڕۆیە› 🇮🇷 اکنون

**ئێستا**[2]: ئاوەڵکار. ئیستا؛ ئیستە؛ ئیستێ؛ ئیسە؛ ئێستە؛ ئێستێ؛ ئانکا؛ ئانوها؛ ئانۆکا؛ نهۆ؛ نووکە ‹ئێستا لە بەر چاوم ون بوو› 🇮🇷 اکنون

**ئێستاکانێ** / êstakanê/: ئاوەڵکار. ئێستا 🇮🇷 اکنون

**ئێستاکونێ** / êstakûnê/: ئاوەڵکار. ئێستاکە؛ هەرنهۆ 🇮🇷 همین حالا

**ئێستاکە**[1] / êstake/: ناو. ئیستا؛ ئێستاکانێ؛ ئێستاکوونێ؛ ئێستاکێ؛ ئێستەکوونێ؛ ئێستەکە؛ ئێستێکانێ؛ ئێستەکانێ؛ ئیستاکە؛ ئیستەکێ؛ ئیستەکوونێ؛ هەرنهۆ ‹گوتی ئێستاکە باشە تا بەیانی› 🇮🇷 هم‌اکنون

**ئێستاکە**[2]: ئاوەڵکار. ئێستا؛ ئێستاکانێ؛ ئێستاکوونێ؛ ئێستاکێ؛ ئێستەکوونێ؛ ئێستەکە؛ ئێستێکانێ؛ ئێستەکانێ؛ ئیستاکە؛ ئیستەکێ؛ ئیستەکوونێ؛ هەرنهۆ ‹ئێستاکە بۆتی دێنم› 🇮🇷 هم‌اکنون

**ئێستاکێ** / êstakê/: ☜ **ئێستاکە**

**ئێستاولا**[1] / êstawla/: ناو. داهاتوو ‹لە پاش دەسبازی و هەرا و زەنایان/ دێنە سەر تەگبیر بۆ ئێستاولایان «قانع»› 🇮🇷 آینده

**ئێستاولا**[2]: ئاوەڵکار. ئێستا و بەدوا؛ لەمەو بە دوا؛ پاش ئێستا ‹ئێستاولا من دەڵێم چ بکەین› 🇮🇷 از این به بعد

**ئێستر** / êstir/: ناو. هێستر؛ هێسر؛ قانتر؛ قاتر؛ داک ماینی کەر باب 🇮🇷 استر

⊡ **ئێستر باڵانی:** قاتری داک گوێرێژی باوک ئەسپ 🇮🇷 استر پدر اسب

**ئێستک** / êstik/: ☜ **ئێسك**

**ئێستە** / êste/: ☜ **ئێستا**

**ئێستەکانێ** / êstekanê/: ☜ **ئێستاکە**

**ئێستەکونێ** / êstekûnê/: ☜ **ئێستاکە**

**ئێستەکە** / êsteke/: ☜ **ئێستاکە**

**ئێستەیەوە** / êsteyewe/: چاوگ. دۆزینەوە 🇮🇷 یافتن

**ئێستێ** / êstê/: ☜ **ئێستا**

**ئێستێکانێ** / êstêkanê/: ☜ **ئێستاکە**

**ئێسقا** / êsqa/: ناو. سی‌وشکە 🇮🇷 استسقا

**ئێسقان** / êsqan/: ☜ **ئێسك**

**ئێسک** / ês(i)k/: ناو. ئێستک؛ ئیستک؛ هێستک؛ هێسک؛ یەسک؛ هەست؛ هەستوو؛ هەستۆ؛ هەستە؛ هەستی؛ هێستی؛ ئێسقان؛ ئیسقان؛ ئیسخوان؛ یەسقان؛ سخان؛ سقان؛ سۆقان؛ سوقان؛ سووقان؛ یێسقان؛ پێشە؛ کاتە؛ وەرسەل؛ چوارچێوەی لەش 🇮🇷 استخوان

⊡ **ئێسکی ناو برین:** *[کنایە]* ملۆزم؛ هەمیشە مایەی دەردیسەر و نارەحەتی 🇮🇷 استخوان لای زخم

**ئێسکبژیشک** / ês(i)kb(i)jîşk/: ناو. ئۆرتۆپێد 🇮🇷 ارتوپد

**ئێسکبژیشکی** / ês(i)kb(i)jîşkî/: ناو. ئۆرتۆپێدی 🇮🇷 ارتوپدی

**ئێسکڕزاو** / êskř(i)zaw/: ئاوەڵناو. هەستی کۆلی؛ ئێسک‌شکاو 🇮🇷 پوسیده استخوان

**ئێسکسوک** / ês(i)ksûk/: ئاوەڵناو. *[مجاز]* ڕەزاسووک؛ خوێن‌شیرین؛ ڕۆح‌سووک 🇮🇷 دوست‌داشتنی

**ئێسكشكاو** / êskş(i)kaw/: ئاوەڵناو. هەستی کوڵی؛ ئێسک‌ڕزاو ☰ پوسیده استخوان

**ئێسكقورس** / ês(i)kqurs/: ئاوەڵناو. [مەجاز] خوێنتاڵ؛ ڕەزاگران؛ کرێت ☰ نامحبوب

**ئێسكگران** / ês(i)kg(i)ran/: ئاوەڵناو. [مەجاز] خوێنتاڵ؛ گۆشتاڵ؛ ڕەزاگران ☰ گرانجان

**ئێسكگرەوە** / ês(i)kg(i)rewe/: ناو. شکستەبەن ☰ شکسته‌بند

**ئێسكنەرمی** / ês(i)knermî/: ناو. [پزیشکی] ڕاشیتیسم ☰ راشیتیسم

**ئێسكوپرووسك** / êsk û p(i)řûsk/: ناو. نیوە ڕزیوی لاشی مردوو ‹... تۆ خوا ئەم جارە کە کۆ دەبنەوە/ چەرەز و میوەی سەر میزەکانیان هەموو وەلا نێن/ ئێسک‌وپرووسکی ئەنفالەکانیان لە بەردەم دانێن «پەشێو»› ☰ شکسته استخوان

**ئێسكەسەر** / êskeser/: قاپێلکەسەر؛ کەللەسەر ☰ جُمجُمه

**ئێسكەماسی** / êskemasî/: ناو. گووسە ☰ استخوان ماهی

**ئێسكەمەڵاژ** / êskemeɫaj/: ناو. ڕەقەمەڵاژ؛ بەری پێشەوەی مەڵاشوو لە دوو ئێسکی مەڵاژ پێکهاتووە ☰ سخت‌کامه

**ئێسن** / ês(i)n/: ☜ ناسن

**ئێسیر** / êsîr/: ☜ نەسیر

**ئێش** / êş/: ناو. یەش؛ ژان؛ ژوون؛ ژانژوو؛ دەژین؛ ئالنگ؛ گزیرک؛ هەستی ناخۆش و ئازاردەر کە بە هۆی گەزن یان نەخۆشییەوە بەدی دێ ‹ئێشی پشت› ☰ درد؛ آزار

⊡ **ئێش پێگەیشتن/ پێگەیین:** تووشی ئێش و ئازار بوون ☰ درد آمدن

**ئێش پێگەیاندن:** تووشی ئێش و ئازار کردن ☰ درد رساندن

**ئێش کردن:** ئێشان ☰ درد کردن

**ئێشازراڤ** / êşaz(i)rav/: ناو. ئازارەباریکە ☰ سل

**ئێشاگران** / êşag(i)ran/: ناو. کەوتوویی؛ گرانەتا؛ گرانەتێ؛ نەخۆشییەکی گیرۆیە ئەسپێ ڕایدەگوێزێ ☰ تیفوس

**ئێشان** / êşan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //ئێشای؛ دەئێشی؛ بئێشێ (بئێشە)// یەشان؛ ژان کردن؛ ئێش کردن؛ بە ئازار بوون ‹دڵ موشەببەک بوو لە بەر ئێشانی نیشانی موژەت/ حەیفە قوربان! ئاخر ئەم نیشانەیە شانی هەیە «نالی»› ☰ درد کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ئێشاو/ چاوگی نەرێنی: نەئێشان

**ئێشاندن** / êşandin/: چاوگ. تێپەڕ. //ئێشاندت؛ دەئێشێنی؛ بئێشێنە// ئازار پێدان؛ ئێش پێگەیاندن ☰ آزردن؛ به درد آوردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەئێشاندن

**ئێشای** / êşay/: چاوگ. ئێشان؛ ژان کردن ‹پات وە تۆی پەردەی پێوار سەر کێشان/ جە کام هامدەمێ خاترت ئێشان «مەولەوی»› ☰ درد کردن

**ئێشدار** / êşdar/: ئاوەڵناو. بەئێش؛ بە ئازار ☰ دردناک

**ئێشك** / êş(i)k/: ناو. ١. هێچک؛ ئاڵقەداری سەر گوریس و کەژوو ٢. کێشک؛ پاس ☰ ١. حلقه‌ی باربند ٢. کشیک

⊡ **ئێشک دان:** ١. شەتەک دان؛ توند بەستن؛ جیرەبابە دان ٢. ئێشک کێشان؛ کێشک دان ☰ ١. محکم بستن ٢. نگهبانی دادن

**ئێشک کێشان:** ☜ **ئێشك دان ـ٢**

**ئێشک گرتن:** پاسەوانی کردن ☰ نگهبانی دادن

**ئێشكانن** / êşkanin/: چاوگ. بەزاندن ☰ شکست دادن

**ئێشكانین** / êşkanîn/: چاوگ. شکاندن ☰ شکاندن

**ئێشكچی** / êşikçî/: ناو. جەزایەرچی؛ زێرەڤان؛ پاسەوان؛ پاسدەری شەوانە ‹بە شەو ئێشکچی ماڵی خان و ئاغام/ بە ڕۆژ کۆلکێشی پووش و دڕک و داڵم

«قانع»› 🇮🇷 نگهبان

**ئێشک‌گر** / êşikgir/: ناو. جەزایەرچی؛ پاسەبان؛ پاسەوانی شەو ‹تۆم داوەتە دەس خودای نیگەهبان/ ئێشک‌گری تۆن پەری لە ئاسمان «بێکەس»› 🇮🇷 نگهبان

**ئێشکەدۆ** / êşkedo/: ☜ ئێشکە ـ١

**ئێشکیاین** / êşk(i)yayn/: چاوگ. شکان؛ شکیان 🇮🇷 شکسته شدن

**ئێشنای** / êşnay/: چاوگ. ئازار دان 🇮🇷 آزردن

**ئێش‌ونێش** / êş û nêş/: ناو. [مەجاز] خۆشی و تاڵی؛ وەشی و تشی؛ دیاردە، رووداو یان هۆکاری لەبار و نالەبار، پێکەوە یا بە شوێن یەکتردا 🇮🇷 نیش و نوش

• **ئێشە** / êşe-/: پاشەوشە. نیشانەی هەبوونی ژان ‹سەرئێشە؛ دڵ‌ئێشە› 🇮🇷 ـ درد

• **ئێشێن** / êşên-/: پاشەوشە. ژان‌پێ‌دەر ‹سەرئێشێن› 🇮🇷 دردآور؛ آزارنده

**ئێع** / ê'/: ☜ یەع

**ئێڤار** / êvar/: ناو. ئێوارە؛ ئەنگۆرێ؛ عەسر ‹چراخم بێ تۆ چراخم بێ تۆ/ ئێڤار تا سەحەر بێ خاوم بێ تۆ «بێسارانی»› 🇮🇷 دم غروب

**ئێڤتین** / êvtîn/: چاوگ. وەرمان؛ پەنەمان؛ هەڵماسین و ڕەش و شین هەڵگەڕانی ئەندام بە هۆی لێدانەوە 🇮🇷 کبود شدن (بدن)

**ئێڤیتاندن** / êvîtandin/: چاوگ. وەرماندن؛ پەنەماندن؛ هەڵمساندن و ڕەش و شین کردنی ئەندامی لەش 🇮🇷 کبود کردن

**ئێق**[١] / êq/: ناو. ١. هێڵنج؛ ڕەوتی دڵ شێوان ٢. [مەجاز] ڕەوتی کشانەوەی ئاو یا خەڵک لە بەر زۆری و بێ‌دەرەتانی ٣. ڕەوتی نم کێشان 🇮🇷 ١. تهوع ٢. حالت یا فرایند پس زدن آب یا جمعیت به دلیل تراکم ٣. نم‌کشیدگی

▣ **ئێق دانەوە:** پەنگ خواردنەوە ‹ئاوەکە پێشی گیرابوو ئێقی دایەوە› 🇮🇷 جریان نیافتن و جمع شدن

**ئێق کردنەوە:** پەنگ خواردنەوە و بەرە پاش گەڕانەوە ‹حەشامات هێندە زۆرە و پێشی ناڕوا ئێقی کردۆتەوە› 🇮🇷 جریان نیافتن و پس زدن

**ئاوی ژیان ئێق کردنەوە:** [پلار] پا جووت کردن؛ سلسارد بوونەوە؛ مردنی بەدفەڕ ‹دوای عومرێک ملهوڕی و چەوساندنەوەی خەڵک، ئەوساڵ ئاوی ژیانی ئێق کردەوە› 🇮🇷 ریق رحمت را سرکشیدن

**ئێق**[٢]: دەنگ. هێق؛ حێق؛ وێق؛ وێغ؛ دەنگی ڕشانەوە 🇮🇷 عُق

**ئێقلاب** / êqlab/: ناو. بەرکوت؛ کەمێ گەنم کوتان بۆ نانی پێداویست، بەر لە خەرمان 🇮🇷 پیشکوب خرمن

**ئێک** / êk/: ناو. یەک؛ نیوەی دوو 🇮🇷 یک

**ئێکاتی** / êkatî/: ناو. یەکیەتی؛ ئێکەتی 🇮🇷 اتحاد

**ئێکانە** / êkane/: ناو. یەکانە؛ نێرەبەراز 🇮🇷 گُراز نر

**ئێکاوێک** / êkawyêk/: ناو. دەرمان یان عەلاجی کاری 🇮🇷 داروی مؤثر

**ئێکتر** / êktir/: جێناو. هەڤدوو؛ یەکتر 🇮🇷 همدیگر

**ئێکجار** / êkcar/: ئاوەڵکار. یەکجار؛ ئێگجار؛ ئێجگار ‹ئێکجار سۆند دەخوا› 🇮🇷 بسیار

**ئێکجارەکی** / êkcarekî/: ☜ ئێکجاری

**ئێکجاری** / êkcarî/: ئاوەڵکار. یەکجاری؛ ئێگجاری؛ ئێکجارەکی؛ ئێجگاری ‹ئێکجاری ڕۆی و چیتر نەماندیتەوە› 🇮🇷 یکباره

**ئێکماڵ** / êkmał/: ئاوەڵناو. ماڵ‌لەیەک: ١. شەریک؛ برابەش ٢. دۆستی زۆر نزیک ٣. هاوڕێ یا جیرانی بەقەدر 🇮🇷 ١. شریک در ثروت ٢. دوست و یار جانی ٣. همراه یا همسایەی گرامی

**ئێکەتی** / êketî/: ☜ ئێکاتی

**ئێکەم** / êkem/: ئاوەڵناو. هەوەڵ؛ یەکەم 🇮🇷 یکم

**ئێکەمین** / êkemîn/: ئاوەڵناو. یەکەمین؛ هەوەڵین 🇮🇷 اوّلین

**ئێکیان** / êkyan/: ئاوەڵکار. هەرتاک؛ هەرکام 🇮🇷 هریک

**ئێگجار / êgcar/:** ☜ **ئێکجار**

**ئێگجاری / êgcarî/:** ☜ **ئێکجاری**

**ئێگر / êgir/:** ☜ **ئاگر**

**ئێگره / êgre/:** جێناو. ئەگرە؛ ئێرە ⊑ اینجا

**ئێگنه / êgne/:** جێناو. ئەوێنە؛ ئەوێ ⊑ آنجا

**ئێگه / êge/:** جێناو. ئێرە ‹ئێگە ڕۆشنا› ⊑ اینجا

**ئێل / êl/:** ناو. ئێڵ؛ خێڵ؛ عێل؛ کۆمەڵە کۆچەرێک پێکەوە ⊑ ایل

**ئێلات / êlat/:** ناو. ڕەوەند؛ ئەوانەی دەچنە بانەمەڕ ⊑ ایلات

**ئێلجار / êlcar/:** ☜ **ئێڵجاڕ**

**ئێلده / êlde/:** ناو. پازدە ڕۆژی هەرە ساردی زستان ⊑ پانزده روز اوج سرمای زمستان

**ئێلەقه / êleqe/:** ☜ **ئاموور-١**

**ئێلەگ / êleg/:** ☜ **ئێڵەگ**

**ئێڵ / êł/:** ☜ **ئێل**

**ئێڵاخ / êłax/:** ناو. زۆزان؛ هەوار؛ هاوینەوار؛ لەیلاخ ‹زۆسانان پای هەرد ئێلاخان سەردەن/ لازمەن هەوای گەرمەسێر کەردەن «مەولەوی»› ⊑ ییلاق

**ئێڵجاڕ / êłcař/:** ناو. ئێلجار؛ ئێڵەجاڕ؛ گەلەکۆمە؛ گەلەکۆمەکێ؛ هەرەوەز ‹هەی بەیانەوە ئێڵەجاڕی ئێڵەن/ هەر کەس مەکسش کەرد جە ئێڵی وێڵەن «خانای قوبادی»› ⊑ تعاون؛ کار گروهی

**ئێڵەجاڕ / êłecař/:** ☜ **ئێڵجاڕ**

**ئێڵەک / êłek/:** ناو. ئەڵەک؛ هێڵەگ؛ مۆخڵ؛ بێژنگی کونتەنگ بۆ دابێژتنی هاڕدراو ⊑ الک

**ئێڵەگ / êłeg/:** ناو. ئێلەگ؛ سوخمە؛ یەلەک ⊑ یلک

**ئێم / êm/:** ناو. ئالکی یەکسم ⊑ علیق ستور

**ئێمسک / êmisk/:** ناو. ئێمشک؛ تامیسک؛ زیپکەی لێوی تادار ⊑ تبخال

**ئێمشک / êmişk/:** ☜ **ئێمسك**

**ئێمه / ême/:** جێناو. ئیمە؛ ئەم؛ مە؛ ئاماژە بۆ هەوەڵ کەسی کۆ ‹ئێمە دەمێنینەوە› ⊑ ما

**ئێمەگەل / êmegel/:** جێناو. ئێمە؛ هەموو ئێمە ⊑ ماها

**ئێمەمانان / êmemanan/:** ☜ **ئێمەومانان**

**ئێمەنی / êmenî/:** ناو. جۆرێک کەوشی سووری بێپاژنەی پیاوانە ⊑ نوعی کفش تخت مردانه

**ئێمەومانان / êmewmanan/:** جێناو. ئێمەمانان؛ ئێمەگەل ‹ئیتر برا گیان ئەم کوردستانە/ زیندانی دەستەی ئێمەومانانە «قانع»› ⊑ ما و امثال ما

**ئێنان / ênan/:** ☜ **ئانین**

**ئێنجار / êncar/:** ☜ **ئینجار**

**ئێنشتێنیوم /ênîştênyum/:** ناو. توخمێکی کیمیایی کانزایی ڕادیۆئەکتیڤە بە ژمارەی ئەتومی ٩٩ و بە پێنج ئیزۆتوپەوە، لە ٢٤٨ تا ٢٥٢ ⊑ اینشتنیم

**ئێنه / êne/:** ☜ **ئەوێ**[٢]

**ئێو / êw/:** ناو. جۆ؛ جە ⊑ جو

**ئێوار / êwar/:** ناو/ ئاوەڵکار. ئێڤار؛ دەمی عەسر ⊑ عصر

**ئێواره / êware/:** ناو/ ئاوەڵکار. هێوار؛ هێوارە: ١. ئێوار؛ دەمی عەسر ٢. تاریکان؛ ویرەگا؛ هەرەتگای تەنگ ⊑ ١. عصر ٢. تنگ غروب

**ئێواش / êwaş/:** ☜ **هێواش**

**ئێور / êwir/:** ناو. قەباڵە؛ قەواڵە ⊑ سند

**ئێورین / êw(i)rîn/:** ☜ **هێورین**

**ئێوه**[١] **/ êwe/:** ناو. بێوە؛ پیاوی بێژن یان ژنی بێمێرد ⊑ بیوه

**ئێوه**[٢]**:** جێناو. هون؛ ئەنگۆ؛ ئێوەگەل؛ هنگ؛ ئاماژە بۆ دووهەم کەسی کۆ ‹ئێوە کێن؟ خێڵی درۆ/ گەلی دەم پڕ لە هەرا «سوارە»› ⊑ شما

**ئێوەت / êwet/:** ناو. ئیوەت؛ سەرپەرشتی؛ کاری بەخێو کردن؛ ئاگاداری کردن ⊑ سرپرستی

**ئێوەگەل / êwegel/:** ☜ **ئێوە**[٢]

**ئێهێ / êhê/:** دەنگ. ١. بەڵێ بەڵێ ٢. هۆی؛ های (پیتی بانگ کردن) ⊑ ١. بلی بلی ٢. کلمەی ندا

# ا

**ا**[1] / a/: پیت. نیشانەی دووهەمین پیتی ئەلفوبێی زمانی کوردی، کە دەنگێکە و دیارە ناکەوێتە سەرەتای وشەوە نشانەی دومین حرف الفبای زبان کُردی

**تێبینی**: ئەم فۆنیمە، وەک هەموو دەنگەکانیتر (ڤاوڵەکان)، ناکەوێتە سەرەتای وشە و دەسپێکی بڕگەوە و هەمیشە کپێکی پێویستە پێشی کەوێ.

**ا**[2]: ناو. ئا؛ ئەلف؛ ناوی دووهەمین پیتی ئەلفوبێی زمانی کوردی الف؛ دومین حرف الفبای زبان کُردی

**ـ ا**[3]: جێناو. دەکەوێتە پاشەوەی ڕەگی ڕابردووەوە، کاری ڕابردووی تاکی غایب پێک دێنێ ‹داینا؛ هەڵسا؛ سووتا› نشانەی ماضی مُطلق، سوم شخص مُفرد

**ـ ا ـ**[4]: نێوانگر. لە نێوان دوو وشەدا دێ و ئاوەڵکار دروست دەکا ‹سەراسەر؛ دوورادوور› میانوند قید ساز

**ـ ا**[5]: پاشگر. ١. دەکەوێتە پاشەوەی ڕەگ یان ڕیشەوە و ئاوەڵناو دروست دەکا ‹زانا؛ کارا؛ هێزا› ٢. دەکەوێتە پاشەوەی ئاوەڵناوەوە و ناو دروست دەکا ‹گەرما› ٣. نیشانەی کۆ ‹مرۆڤا؛ سوارا› ١. صفت‌ساز ٢. اسم‌ساز ٣. علامت جمع

**ـ ات** / at-/: پاشگر. نیشانەی کۆ ‹باغات؛ ماڵات؛ خێڵات› ـ ات

**ـ اتی** / atî-/: پاشگر. ـ یەتی؛ ـایەتی؛ نیشانەی چۆنیەتی یان هاوگەڕی ‹حیزاتی› ـ انگی

**ـ اخ** / ax-/: پاشگر. زەوی ‹شۆراخ؛ ڕێژاخ› زمین

**ـ ار** / ar-/: پاشگر. ١. لەگەڵ ڕەگی کار (ناوی چاوگ)دا ناوی مانا دروست دەکا ‹وتار› ٢. لەگەڵ ڕەگی کاردا ناوی کرۆک دروست دەکا ‹خەوار؛ کێشار› ٣. لەگەڵ ڕەگی کاری ڕابردوودا ناوی چاوگ دروست دەکا ‹کردار؛ کوشتار› ٤. لەگەڵ ڕەگی کاردا ئاوەڵناو دروست دەکا ‹بێزار› ١تا ۴. ـ ار

**ـ اژۆ** / ajo-/: پاشەوشە. هاژۆ: ١. ئاژوێن؛ لێخوڕ؛ بەڕێوەبەر ‹بەرگاژۆ› ٢. ـــ زەدە؛ پێکراو ‹گەرماژۆ؛ دەساژۆ› ٣. شوێنهەڵکەر؛ شوێنگێڕ ٤. پەرەسێن؛ لکوپۆ دەر (ڕیشە) ١. ـ ران ٢. ـ زده ٣. ردیاب ۴. ریشه دوان

**ـ اک** / ak-/: پاشگر. ١. شیاو بۆ کارێک ‹خۆراک؛ پۆشاک› ٢. جێ ‹زماک› ١. ـ اک ٢. جا

**ـ الی** / alî-/: ☜ **ـ اوی ـ٢**

**ـ اڵ** / ał-/: پاشگر. ١. نیشانەی هاوچەشن بوون؛ خاوەن ویکچوون (لە ناو، ناو و ئاوەڵناو دروست دەکا) ‹چنگاڵ› ٢. نیشانەی هاوگەر بوون ‹ڕاستاڵ› ٣. جێ؛ شوێن ‹ڕووتاڵ› ٤. نیشانەی زۆری و هاوچەشنی (ناو دروست دەکا) ‹پووشاڵ› ٥. *[پەلار]* زۆر؛ فرە (لە ڕەگ، ئاوەڵناو دروست دەکا) ‹گەڕاڵ؛ تراڵ› ☰ ١. اسم و صفت‌ساز ٢. صفت‌ساز ٣. از صفت، اسم مکان‌ساز ٤. اسم‌ساز ٥. صفت‌ساز

**ـ اڵو** / ału-/: پاشگر. خاوەن بارودۆخ یان چۆنیەتییەک ‹خەواڵوو› ☰ ـ آلود

**ـ امۆژ** / amoj-/: پاشەوشە. فێرکەر ‹کارامۆژ› ☰ ـ آموز

**ـ ان[1]** / an-/: پاشگر. ١. نیشانەی کۆ ‹کوردان؛ پیاوان؛ ژنان› ٢. نیشانەی کات و زەمان ‹ڕۆژان؛ پاییزان؛ ڕێبەندان؛ نێوجێژنان› ٣. نیشانەی جێ و شوێن ‹هەڵووژان؛ زووران؛ سەختان؛ بەرزان› ٤. نیشانەی ڕێوڕەسمی تایبەت ‹خەنەبەندان› ٥. نیشانەی کایە و یاری ‹گوێزان؛ قەمچان؛ تۆپان؛ هەڵماتان› ☰ ١و٢. ـ ان ٣. ـ گاه ٤. ـ ان ٥. ـ بازی

**ـ ان ـ[2]**: نیوانگر. ١. نیشانەی پەیوەندی ‹پەڕانپەڕ؛ بەرانبەر› ٢. تا؛ نیشانەی ڕەوتێکی بەردەوام ‹شەوانشەو؛ دەساندەس› ☰ ١. ـ ا ـ ٢. ـ بە ـ

**ـ انە** / ane-/: پاشگر. ١. لە چەشن؛ هەر وەک؛ وەکوو ‹ژیرانە؛ گەوجانە› ٢. شیاو؛ هێژا ‹پیاوانە؛ ژنانە› ٣. لە بەرانبەر یا بۆ هەر یەک ‹شەوانە ساڵانە› ٤. بە بۆنەیەکەوە ‹پووشانە؛ جێژنانە؛ پرسانە› ٥. بەندیوار؛ هاوگەر ‹خووگانە؛ مارانە› ٦. هەند و میزان (دەکەوێتە پاشەوەی ڕەگەکانەوە و ناو و ناوی چاوگ دروست دەکا) ‹کێشانە› ☰ ١تا ٦ ـ انە

**ـ انی** / anî-/: پاشگر. شوێن؛ جێ ‹وشکانی› ☰ ـجا

**ـ او ـ[1]** / -aw-/: نێوانگر. ١. نیشانەی ڕەوتێکی نەپس ‹شەواوشەو؛ دەماودەم› ٢. نیشانەی چۆنییەتییەک ‹پڕاوپڕ؛ گەرماوگەرم› ☰ ١و٢. ـ ا ـ

**ـ او[2]**: پاشگر. جێ ‹سارداو؛ کناراو› ☰ ـ ابە

**ـ اوا** / awa-/: پاشگر. جێ؛ شوێن ‹ئاسناوا؛ کەروێشکاوا› ☰ ـ آباد

**ـ اوڵی** / awłî-/: ☜ **ـ اوی ـ٢**

**ـ اوە** / awe-/: پاشگر. جێ ‹سارداوە؛ پەژاوە› ☰ ـ ابە

**ـ اوی** / awî-/: پاشگر. ١. شوێن و جێگە ‹شێلاناوی› ٢. ـــ الی؛ ـ اوڵی؛ ئاڵوو؛ تلاو؛ پێوەبوو؛ تێهەڵساو ‹ئارداوی؛ قوڕاوی› ☰ ١. جا ٢. ـ آلود

**ـ اوێژ** / awêj-/: پاشەوشە. فڕێدەر؛ هاوێژەر ‹بەرداوێژ› ☰ ـ انداز

**ـ ایەتی** / ayetî-/: پاشگر. ١. نیشانەی چۆنیەتی یان هاوگەر بوون ‹ڕەسەنایەتی؛ کوردایەتی؛ مەردایەتی› ٢. مەڵبەند و ژێگە ‹مەنگوڕایەتی؛ باڵەکایەتی› ٣. لە پاش ناوێکەوە، ئاوەڵناو دروست دەکا ‹کۆمەڵایەتی› ٤. لە پاش ناوێکەوە، ناوێکی دیکە دروست دەکا کە نیشانەی لە چۆناوچۆنییەکدا بوونە ‹باوکایەتی؛ هێژای بلیمەت لە ئازایەتی/ بارانی ڕەحمەت بۆ کوردایەتی «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ ١. ـ انە ٢. ـ ان ٣. ـ ی ٤. ـ یت؛ گری

**ـ ایی** / ayî-/: پاشگر. ١. ئاوەڵناو دەکاتە ناو ‹درێژایی؛ پانایی؛ ڕووناکایی› ٢. ناو دەکاتە ناوێکی دی ‹ترووسکایی؛ دەشتایی؛ گۆڕایی› ☰ ١. ـ ی ٢. ـیی

# ب

◆

**ب / b/**: پت. نیشانەی سێهەمین پیتی ئەلفوبێی زمانی کوردی ■ ب؛ نشانەی سومین حرف الفبای زبان کُردی

**ب[١] / bi/**: ناو. ناوی سێهەمین پیتی ئەلفوبێی زمانی کوردی ■ ب؛ سومین حرف الفبای زبان کُردی

**ب[٢]**: ئامراز. بە ‹لەو سەحەر جەولان ددت بایێ سەبایێ راست و چەپ/ سووسەن و سونبول ب مەستی بێن سەمایێ راست و چەپ «مەلای جزیری»› ■ به

**بـ[٢]**: پێشگر. ١. نیشانەی فرمان ‹بێژە؛ بڕۆ؛ بگێرە جە دەس ئێ کەمتاڵەوە/ بنیەش بەو گۆنای مشکین خاڵەوە «سەیدی»› ٢. نیشانەی ڕانەبردووی مەرجی ‹بکێشم؛ بنێژم؛ من لە زنجیر و تەناف و دار و بەند باکم نییە/ لەت ـ لەتم کەن، بمکوژن، هێشتا ئەڵێم کوردم ئەمن «هێمن»› ٣. سازکەری بکەردی کار یان خاوەنی تایبەتمەندییەکی بەرچاو ‹ببڕ؛ بکوژ› ■ بـ: ١. نشانەی وجە امری ٢. نشانەی ماضی التزامی ٣. نشانەی صفت فاعلی

**با[١] / ba/**: ناو. ١. ئاکامی جێگۆڕکێی هەوای سارد و گەرم ‹با بێت شەن دەکا، باران بێت ئاش دەخاتە گەڕ «مەسەل»› ٢. وزە و ئارەزووی هێندێ جانەوەری مێچکە بۆ نێرەکەی ٣. نەخۆشی و ژانی جومگەی لەش ٤. هەڵمساویی زگ ٥. ڕەوتی هەڵمسانی ئەندامانی لەش ٦. گازی ناو زگ ‹منداڵێک بایەکی لێ بۆوەوە و قسەکەی پێ بڕی!› ٧. پێچ ‹بای گوریس› ٨. بانگ؛ قاو ‹حەسۆ! با کرە ژنا خوە› ٩. */پلار/* هەوا؛ دەعیە و دەمار ‹نەفەس بگرە لە هاتوچۆیی خۆڕایی هەتا ماوی/ کە ئەم بایە هەتا ئێستاکە هەر عومری بە با داوی «نالی»› ■ ١. باد ٢. باه ٣. رُماتیسم مفصلی ۴. آماس شکم ۵. آماس اندام ۶. باد شکم ۷. تاب ۸. بانگ؛ ندا ۹. تکبُّر

◙ **بای پێچەوانە**: دژەبا؛ ئەو بایە پێچەوانەی ڕۆیشتنی گەمیە و پاپۆڕ و ... هەڵدەکا و هۆی زەحمەت و زیانە ‹لەبەر بای پێچەوانەی غەم لە هیچ لا ناگرم ئۆقرە/ لە عەردی وشکی دووری جاویدانا مەوجی دەریا خۆم «بێخود»› ■ باد مخالف

**بای دارناوس**: بای وادە؛ بای وەعدە ■ باد بهاری

**بای دەبور**: بای خۆراوا؛ بای ماشەڵان ■ دبور؛ باد مغرب

**بای زریان**: بای ساردی پایزانە کە لە لای باکوورەوە هەڵدەکا ‹ڕۆژپەڕە، ساردە کزەی بای زریان/ کاتە بۆ ژینی لەدەسچوو گریان «سوارە»› ■ باد سرد پاییزی

**بای زەمەن**: بای توند؛ بای سەخت ■ باد شدید

**باى سوور:** سوورەبا؛ بای ممبارەک؛ نەخۆشییەکی گرانی پێستە ☰ باد سرخ

**باى سەبوون:** ڕەشەبا؛ بای زۆر گەرم کە باخ و بێستان وشک دەکا ‹خوسووس شەرارەی دووری زۆر کەردەن/ مەزرەعەی هەستیم بای سەبوون بەردەن «مەولەوی»› ☰ باد سام

**باى سەرسەر:** بای زۆر توند ☰ باد صَرصَر

**باى شەماڵ:** بای لە باشوورەوە بۆ باکوور ‹تاقەدارێ بووم وە بان یالەوە/ عاجز بووم وە دەس بای شەماڵەوە «فولکلۆر»› ☰ باد شمال

**باى کەپۆ:** ١. جۆرێ مار لە تیرەی ئەفعی، کاتی دیتنی دژمن ملی هەڵدێنێ و دەهووشێنێ ٢. سێروو؛ شمشێربالٚ ٣. *[کنایە]* لووتبەرزی؛ فیز و دەمار ☰ ١. نوعی افعی ٢. سار ٣. باد غبغب؛ فیس و افادە

**باى کەللە:** *[کنایە، پلار]* ١. فیز؛ بای کەپۆ ٢. کەلکەڵەی دەسەڵات ☰ ١. غرور ٢. هوای قدرت

**باى گەنۆ:** قرقێنە؛ قرپە ☰ آروغ

**باى وادە:** بای وەعدە؛ بای دارئاوس؛ بای سەرەبەهار ‹قوربانت بم ئەی بای وادە/ ڕووبەند لە سەر یارم لادە/ بە دیتنی دڵم شادە «فولکلۆر»› ☰ باد بهاری

**باى وەشت:** سووکەبایەکە بارانی لە شوێنە ‹هەناسەیان بۆم وێنەی بای وەشتە/ لە کنیسە بم، مزگت کەنەشتە «فولکلۆر»› ☰ باد باران‌خیز

**باى وەعدە:** بای وادە؛ بای دارئاوس؛ شەماڵی سەرەبەهار کە بەفر دەتوێنێتەوە و شینایی دەگەشێنێتەوە ‹بای وەعدە بەفری بردەوە، یەخ بەندی کردەوە/ گوڵ شەمعی پێکرا، شەرەری جەمرە مردەوە «حاجی قادر»› ☰ باد بهاری

**بە باى باڵ:** بە باوی دڵ؛ لەسەرخۆ؛ بەکاوەخۆ ☰ بدون شتاب و بە آرامی

⊡ **با بە کۆش مانەوە:** ڕەنج بە خەسار چوون ☰ رنج بر باد شدن

**با پیفان:** *[پلار]* خۆ هەڵکێشانی بێ بنەما ☰ بلوف زدن

**با پێدان:** بادان؛ گشت کردنی بەن و فرێت ☰ تاب دادن نخ و ریسمان

**با تێ دان:** ١. نەخۆشی باداری گرتن ٢. با تێ‌کردن؛ بە ناسووس یان قەڵەمە، فوو کردنە ناو لاشەی ئاژەڵ بۆ جیا بوونەوەی پێست لە گۆشت و باشتر کەوڵ بوونی ٣. *[پلار]* با کردنە قول؛ لە خشتە بردن؛ بە یەکێکدا هەڵگوتن و لە خۆ بایی کردنی ☰ ١. مبتلا شدن بە رماتیسم ٢. باد کردن در لاشەی حیوان ٣. هندوانە زیر بغل کسی زدن

**با تێ کردن:** ١. با کردنە ناو شتێ ٢. *[مەجاز]* دنە دان؛ هان دان ٣. با تێ‌دان ☰ ١. باد کردن در چیزی ٢. شیر کردن ٣. هندوانە زیر بغل کسی زدن

**با تێ وەستان:** تووشی ئازاری زۆری ماسوولکە بوون کە زۆربەی کات لەپڕدا خۆی دەردەخات و جووڵە لەو ئەندامە دەبڕێ ☰ دچار انقباض عضلانی شدن

**با خستن:** وەستانەوەی با؛ قرپە ‹باکەی خست، با بچین› ☰ باد خوابیدن

**با خواردن:** ١. گشت بوون؛ پێچ خواردن ٢. وە بەر با کەوتن؛ با وێکەوتن ☰ ١. تاب خوردن ٢. باد خوردن

**با دان:** ١. پێچ دان؛ لێک‌هاڵاندن ‹کە دەستی ڕۆژگار بای دا سەری من/ سەری شووشەی شەراب وا چاکە با دەم «هێمن»› ٢. با لێ دەرچوون ٣. بە با کردن؛ خەرمان هەڵاویشتن ☰ ١. تاب دادن ٢. باد از چیزی خارج شدن ٣. خرمن باد دادن

**با دانەوە:** ١. گەڕانەوە؛ هەڵگەڕانەوە؛ زڤرین؛ وەگەڕیان ‹ساقیا وا با دەوە! وا با دەوە!/ ڕوو لە لای من کە بە جامی بادەوە «هێمن»› ٢. لە

سووچی کێو یان دیوار بوورین ۳. *[مەجاز]* پەشیمان/ پاشگەز بوونەوە ٤. با بەردان؛ دەردانی بای سک 🇮🇷 ۱. برگشتن ۲. از خم و پیچ گذشتن ۳. پشیمان شدن ۴. باد در کردن

**با دە خۆ کردن:** خۆ توورە کردن 🇮🇷 خود را عصبانی کردن

**با کردن:** ۱. پەنەمان؛ ئاوسان؛ هەلامسان ‹زگم بای کردووە، زۆر دێشێ› ۲. *[مەجاز]* توورە بوون ‹لە داخان بام کردووە و هیچیشم پێ ناکرێ!› 🇮🇷 ۱. آماسیدن ۲. عصبانی شدن

**با کردنە قول:** *[کینایە، پلار]* لە خشتە بردن 🇮🇷 هندوانه زیر بغل زدن

**با لێ بونەوە:** دەرچوونی بای زگی کەسێ ‹ئەو مندالە چی خواردووە هەر بای لێ دەبێتەوە؟!› 🇮🇷 باد شکم خالی شدن

**با هەلکردن:** با هاتن 🇮🇷 باد وزیدن

**با باڵ برین:** بە لێدان، هیلاک کردن؛ هێزوپێز بۆ نەهێشتن 🇮🇷 کتک مفصل زدن

**بای باڵ دان:** ۱. گەڕان لە دەشت و دەر بۆ حەسانەوە و خەم ڕەواندن ۲. گەشەکردن؛ گەورە بوون ‹ئەم نامیلکە هەوەڵ دەرسە بۆ سێ دەستە: تازەلاوان، کە وا تازە بای باڵ دەدەن ... «هەژار، *چوار نامیلکە*»› 🇮🇷 ۱. تفرُّج کردن ۲. رشد کردن

**بای کەسێ دەرچوون:** *[کینایە، پلار]* فس کەسێ نیشتنەوە؛ لە دۆخی هووروووژاو بۆ باری ئاسایی خۆ گەڕانەوە 🇮🇷 تَمَرگیدن

**بە با دان:** دانە دەم باوە: ۱. لە بەر باوە دانان، وەها کە با بیبا ‹بەجێیە کوشتنم، سووتاندنم، خاکت بە با بۆ دام؟/ وتی: ئاهەنگی عیشقی من مەقاماتە لەگەڵ بەستە «مەحوی»› ۲. *[کینایە]* لە بیر خۆ بردنەوە ‹خەمی کۆنە بە با نادەم، خەمی تازە یەخەم دەگرێ!/ مەگەر دەستی قەدەر بێت و لە جەمعی خەم نەجاتم با «قانع»› ۳. *[کینایە]* خەسار کردن؛ بە فیڕۆ دان ‹نەفەس بگرە لە هاتوچۆیی خۆڕایی هەتا ماوی/ کە ئەم بایە هەتا ئێستاکە هەر عومری بە با داوی «نالی»› 🇮🇷 ۱. در مسیر باد گذاشتن ۲. به باد سپردن ۳. هَدَر دادن

**بە با ڕۆیین:** خەسار بوون؛ بە فیڕۆ چوون ‹لە ناکەس‌کارییا خاکم بە سەر، ڕۆیی بە با عومرم/ خودا تۆ بمژێنە تا لە بەر قاپی کەسێ دەمرم «مەحوی»› 🇮🇷 برباد رفتن

**با**[۲]: ئاوەلکار. بۆچی؛ بۆچە نە (بە مانای بەڵێ، لە وەرامی پرسیاری نەرێنیدا) ‹ـ ناچی بۆ کار؟ ـ با، ئێستا دەچم› 🇮🇷 چرا

**با**[۳]: ئامراز. ۱. لە کن؛ ل جەم؛ ل نک؛ بە؛ لەلای ‹کالەکێ من با تەیە؛ تزبیا تە با منە› ۲. نیشانەی پێداگری، بە مانای بهێڵە و لێگەڕێ ‹با بچێ؛ با بخوا؛ خاڵخاسان بێ ئان با باربەلێو بان/ هێلانەی دلان با هەر پەشێو بان «مەولەوی»› ۳. بۆ ئەوەی ‹با تۆ نەیی لەگەڵمان› ٤. ئەگەرچی؛ هەرچەندە ‹قانعا با ئێستە بێنانی بەلام/ عاقبت روزی بیابی کام را «قانع»› ٥. بەرەو؛ بۆ ‹ئەڤێ تۆپ ئاڤێتە با من› 🇮🇷 ۱. نزدِ ۲. بگذار ۳. برای آن کە ۴. اگرچە ۵. بە سوی

**بائەقوش** / ba'equş/: ☜ **بایەقوش**

**بائەنگێو** / ba'engêw/: ☜ **باگر**

**باب**[۱] / bab/: ناو. ۱. باوک؛ باڤ ۲. بەشێک لە کتێب 🇮🇷 ۱. پدر ۲. باب

▣ **باب و برا:** *[کینایە]* زۆر خۆشەویست 🇮🇷 بسیار عزیز

**باب و کاک:** *[کینایە]* پشتیوان؛ یاریدەر ‹بۆ هەزاران باب و کاک بوو› 🇮🇷 پُشتیبان

▣ **باب ئاگای لە کوڕ/ عەولاد نەبون:** *[کینایە]* بشێوی و قاڵمەقاڵم و تێکەولێکە بوون 🇮🇷 سگ صاحبش را نشناختن

**باب دەرهێنان:** *[کینایە]* زۆر توند ئازار دان 🇮🇷 پدر

درآوردن

**باب سوتاندن:** */کینایە/* تووشی زیان و ئازاری زۆر گەورە کردن 🇮🇷 از هستی ساقط کردن

**باب لە کەر کێشان:** */کینایە/* ١. تووشی ئازار و زیانی خراپ کردن ٢. دەسەلات برین 🇮🇷 ١. به زمین سرد زدن ٢. به زیر کشیدن

**باب هێنانە بەر چاو:** */کینایە/* بە سەختی ئازار دان ‹وای لێ کرد بابی هێنایە بەر چاوی› 🇮🇷 پدر درآوردن

**بۆ بابی خۆ عاقڵ کردن:** */کینایە/* چاک تەنبێ کردن 🇮🇷 ادب کردن

**باب**[٢]: ئاوەڵناو. ١. شیاو؛ ڕەوا ‹ئەم کارە بابی تۆ نییە!› ٢. باو؛ لەباو؛ لەسەر دەور ‹ئەمڕۆ ڕیش تاشین بابە› 🇮🇷 ١. روا ٢. مُتداول

**باب**[٣]: ئامراز. شیاوی؛ لەباری ‹یەی فەرشی داشتم مینستە چل شاڵ/ باب پالان بی ئەڕای یابووئاڵ! «شامی»› 🇮🇷 شایستەی

**بابا**[١] / baba/: ناو. ١. ☜ **باپیر** ٢. بابە؛ باوکە؛ بابۆ؛ نازناوی باوک وێڕای ڕێز 🇮🇷 ١. ☜ **باپیر** ٢. پدر

**بابا**[٢]: جێناو. کەسی بێناو ‹بابایەکی خۆمئاسایی، کە بۆ خوێندن چووبێتە ناو کۆمەڵگەی نوێی ئورووپایی ... «هەژار، *چوار ناملکە*»› 🇮🇷 فلان

**با ـ با**[٣]: ئاوەڵکار. بەڵێ ـ بەڵێ؛ بۆچی نا (زیاتر لە وەرامی پرسیاری نەرێنیدا) ‹ـ هەر ناچی؟ ـ با ـ با› ٢. نا ـ نا؛ نەخێر؛ بە هیچ شێوەیەک (**تێبینی**: جیاوازیی سەرەکی نێوان ئەو دوو با ـ بایە لە شێواز و لەحنی دەربڕینیاندایە) 🇮🇷 ١. چرا ـ چرا ٢. نه

**بابادەم** / babadem/: ناو. بابەدەم؛ ئادەم؛ باوکی نەتەوەی مرۆ ‹هێشتا لە بەهەشتا دەگەڕا بابادەم/ لەو ڕۆژەوە من هۆگر و مەستی بادەم «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› 🇮🇷 آدم ابوالبشر

**باباعەمرە** / baba'emre/: ☜ **باوەعومرە**

**بابان** / baban/: ناو. باوان؛ماڵەباب ‹بابانت شێوێ بۆ وا دەکەی؟› 🇮🇷 خانه و سامان پدری

**بابانخراپ** / baban xirap/: ☜ **بابانوێران**

**بابانوێران** / baban wêran/: نزا. بابانخراپ؛ تووکێکی سەرزاری زۆرتر ژنانەیە ‹بابان ویران ئەوە ئەو کارەت بۆ کرد؟› 🇮🇷 نوعی نفرین

**بابرا** / babbira/: ☜ **باوکبرا**

**بابدەست** / babidest/: ☜ **بابەدەست**

**بابردۆک** / babirdok/: ناو. پۆخەڵە؛ گیایەکە بە لق و پۆی زۆر و ڕیشەی ناسکەوە، با هەڵیدەکەنێ و هەڵیدەسووڕێنێ 🇮🇷 أبلک؛ بادآورد

**بابردوو** / babirdû/: ئاوەڵناو. ١. بابردە ٢. سووک؛ بوودەڵە ٣. */کینایە/* فەوتاو؛ لەدەسچووگ ‹مەچۆ لە دووی کلاوی بابردوو «فولکلۆر»› 🇮🇷 ١. بادبُردە ٢. سبُک ٣. بربادرفتە

**بابردە** / babirde/: ئاوەڵناو. ١. بابردوو ٢. */کینایە/* بە فیڕۆ چوو ‹دوای کلاوی بابردە کەوتووە «مەسەل»› ٣. */مەجاز/* تەواو ڕووت و نەدار 🇮🇷 ١. بادبُردە ٢. بربادرفتە ٣. مُفلس

**بابردەڵە** / babirdełe/: ناو. ١. خۆڵ و پووش و قانگەلاشکی بەر با ‹هەر کارێکی کردوویانە ڕایدەنێین و هەر وەکوو تۆزی بابردەڵەی پێ دەکەین «هەژار، *چوار ناملکە*»› ٢. بایلکە؛ باویلکە؛ پەپوولەپاییزە؛ شەلەمین کەرە ٣. */مەجاز/* مرۆی بێتاقەت و کزەڵووکە ‹منیش بابردەڵەی بەر گێژەڵووکەم/ دەمێک لەو قووڵکە، تاوێک لەو چڵووکەم «هێمن»› 🇮🇷 ١. گیاه بادبُردە ٢. قاصدک ٣. آدم ضعیف و مظلوم

**بابردی** / babirdî/: ناو. جۆرێ پارچەی ژنانە 🇮🇷 نوعی پارچەی زنانه

**بابڕ** / babiř/: ئاوەڵناو. ١. */مەجاز/* ئەستوور (بۆ سمێڵ دەگوترێ) ‹شا عەباس ویستی سمێڵ بابڕ کا/ کێو لە بن بێنێ، گەلی کورد قڕ کا! «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ٢. پتەو لە بەرانبەر باوە 🇮🇷 ١. کلفت

٢. استوار

**بابزەن** / babizen/: ناو. باوێشک ☰ خمیازه

**بابلوسک** / bab(i)lûsk/: ☜ **بابلیسك**

**بابلەکانی** / bablekanî/: ناو. جۆرێک هەڵپەڕکێ ☰ نوعی رقص

**بابلیچک** / babilîçik/: ناو. پەنجە تووتە؛ تلیا گچکە؛ قامکە چکۆلە؛ ئەنگووسە تووتەلە ☰ انگشت خنصر

**بابلیسک** / babilîsik/: ناو. بابلووسک؛ بابلیسۆک؛ بابەلیسک؛ گێژەڵووکە؛ شایی جندۆکان؛ گەردەلوول؛ باهۆز ☰ گردباد

**بابلیسۆک** / babilûsok/: ☜ **بابلیسك**

**بابمردو** / babmirdû/: ئاوەڵناو. باوکمردوو؛ بێباوک؛ گدێو؛ هەتیو ☰ یتیم

**بابن** / babin/: ☜ **بابونه**

**بابنۆکەر** / babnoker/: ناو. بابنۆگە؛ خولامی شەڕکەر؛ چەکداری ئاغا ☰ نوکر مسلح خان

**بابنۆگە** / babnoge/: ☜ **بابنۆکەر**

**بابنه پێچ** / babnepêç/: ☜ **بابونه**

**باب و باپیر** / bab û bapîr/: ناو. ئەژدا؛ باڤ و کال ‹ولاتی باب و باپیرم/ جێی هەڵدانی خۆم و بیرم «هێمن»› ☰ نیاکان

**بابوتان** / babutan/: ناو. گەمەیەکی منداڵانە ☰ نوعی بازی کودکانه

**بابوسکە** / babuske/: ناو. سوتوو؛ خۆڵەجگەرە و کاغەز و پەڕۆی سووتاو ☰ خاکستر

**بابوکال** / bab û kal/: ناو. باب و باپیر؛ ئەژدا ‹باب و کالت بە نەزانی مردن/ بیری سەربەرزییە وای لێ کردن «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ نیاکان

**بابونه** / babune/: ☜ **بابونه**

**بابوهێر** / babuhêr/: ☜ **بابوێر**

**بابوێر** / babiwêr/: ناو. بابوهێر؛ بابهێر؛ باخۆر؛ بادرۆخ؛ بادرەوش؛ بادرز؛ کون یان قەڵشتی لە خانوودا کە بای پێدا دێ ☰ بادآهنگ؛ منفذ باد در دیوار

**بابۆ**[١] / babo/: ناو. ١. ☜ **بابە ـ١** ٢. کار و ڕەوتی بۆن هەڵکردنی سەگ و تانجی لە دوای نێچیر ‹تولەی شوێنگێڕی بەردانە ملومۆ/ وە کار کەوتن لە ڕاوێچکە و لە بابۆ «هێمن»› ٣. هەستی تۆڵەکردنەوە ☰ ١. ☜ **بابە ـ١** ٢. عمل بو کشیدن تازی برای پیدا کردن شکار ٣. حس انتقامجویی

**بابۆ**[٢]: ☜ **بەبا**[١]**ـ٢**

**بابۆر** / babor/: ناو. دەرەلینگی هەڵپێچراو ☰ پاچەی ورمالیده

**بابۆرە** / babore/: ☜ **بابۆڵە**

**بابۆڵە** / bабołe/: ناو. بالۆڵە؛ بالۆلە؛ بابۆرە: ١. نەواڵە؛ لەفە؛ لەففە؛ قەپالە؛ قەبالە؛ قەوالە؛ باسترمە؛ کادک؛ دورووم؛ دورمە؛ لۆت؛ هۆچ؛ ساندویچ؛ تیکە پێخۆری بە نان پێچراو ٢. قۆنداخ بۆ کۆرپەی ساوا تێپێچان ٣. گرۆڤەری ئەستوور ☰ ١. ساندویچ ٢. قُنداق ٣. استوانەی قطور

⊡ **بابۆڵە با دان** ورگ لەوەڕاندن؛ مفتەخۆری کردن ☰ شکمچرانی کردن

**بابۆڵەبادەر** / bаbołebader/: ئاوەڵناو. /پەلار/ لۆتەخۆر؛ نەگونجاو؛ ناماقووڵ ☰ بیشخصیت

**بابۆڵە پێچ**[١] / babołepêç/: ناو. دەسرازە؛ بەنی بابۆڵەی منداڵ ☰ بند قُنداق

**بابۆڵە پێچ**[٢]: ئاوەڵناو. لە بابۆڵە پێچراو ☰ قُنداقی

**بابۆڵەفرۆش** / babołef(i)roş/: ناو. ساندویچی؛ نەواڵەفرۆش ☰ ساندویچی

**بابۆڵەیی** / babołeyî/: ئاوەڵناو. ساندویچی؛ نەواڵەیی ☰ ساندویچی

**بابۆنک** / babonik/: ☜ **بابونه**

**بابوسکە** / babûske/: ☜ **باپوسکە**

**بابون** / babûn/: ناو. ١. ☜ **بابونە** ٢. جۆرێ عەنتەر ☰ ١. ☜ **بابونه** ٢. عنترِ بابُون

**بابونه / babûne/**: ناو. بەیبوون؛ بەیبوونە؛ بابوون؛ باواینـــە؛ بـــابن؛ بابونـــە؛ بابۆنـــک؛ بابنـــەپێچ: ١. گیاگلکەوانە؛ حاجیبەیان؛ حاجیلە؛ گوڵەحاجیانە؛ گوڵـــەحاجیلە؛ گوڵـــەفەقێ؛ گوڵـــەفەقیانە؛ شیروشەپاڵ؛ بنە گیایەکی یەکساڵەیە بە گەڵای درێژۆکـــەوە ٢. گوڵـــەبابوونە؛ گوڵەچەرمەڵـــە؛ گوڵەچاوئێشـــە؛ گوراڵەکەچەڵـــێ؛ گوڵـــەچەرمگە؛ گوراڵەچەرمێ؛ گوڵتووتک؛ گوراڵەحاجیانە؛ گوڵی بۆنخۆشی سپی یان زەردی ئەو گیایە کە دەرمانە ١. بابونه ٢. گل بابونه

**بابە / babe/**: ناو. ١. بابۆ؛ باوک؛ بابا ٢. ڕێزناوێکـە بۆ چاک و پیران ‹بابە شێخ؛ بابـە تـاهیر› ٣. بـاوە؛ برا؛ وشەی بەرهەڵست بوون ‹بابە بـۆ کـەس هـیچ ناکا؟!› ١. پدر ٢و٣. بابا

**بابەت١ / babet/**: ناو. ١. کووتاڵ و کەڵوپەل ‹بەڵ شۆڕۆ بەو ئاو کەرەم فەراوان/ بابەت وە بابەت سیاهەی تاوان «مەولەوی»› ٢. بـوار؛ مـەڕ؛ سـەربەس ‹لـە هەموو بابەتێ قسەی لە لایـە!› ١. کـالا ٢. مـورد؛ موضوع

**بابەت٢**: ئامراز. بەرانبەر؛ بابەتی؛ لە بات ‹بابەت ئـەم کتێوە چەند بدەم؟› در ازای

**بابەتی١ / babetî/**: ئاوەڵناو. بە پێی بابەت ‹پێرستی بابەتی› موضوعی

**بابەتی٢**: ئامراز. شیاوی ‹ئەم کارە بابەتی تۆ نییە› درخور

**بابەخولێ / babexulê/**: ☜ باوەخولێ

**بابەدەست / babedest/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* بابدەسـت؛ بێئەنوا؛ هەژار. هەروەها: **بابەدەستی** بینوا

**بابەدەم / babedem/**: ☜ بابادەم

**بابەڕۆ / babeřo/**: ☜ باوکەڕۆ

**بابەژنی / babejinî/**: ناو. زڕدایک زن‌بابا

**بابەعەمرە / babe'emre/**: ☜ باواقوڕەت

**بابەقوڕەت / babeqûret/**: ☜ باواقوڕەت

**بابەکوشتە / babekuşte/**: ناو. دژمنی قەسـایقەس ‹عانەیەک بۆ نەفعی شەخسی سەد وەتەن دێنێ لـە لای/ بابەکوشـتەی خـۆ خوسووسـەن حالـەتی حوڕڕییەتە «فایق بێکەس»› دشمن سرسخت

**بابەگەورە / babegewre/**: ☜ باپیر

**بابـەلیچ / babelîç/**: نـاو. براتووتەڵـە؛ قـامکی ئەنگوستیلە؛ قامکی نێـوان تووتـە و باڵابـەرزە بنصر؛ انگشت حلقه

**بابـەلیچک / babelîçik/**: نـاو. ڕووداوانی سـاڵ وقایع سال

**بابەلیسک / babelîsk/**: ☜ بابلیسك

**بابەلیشک / babelîşk/**: نـاو. قوڕقوڕاچگـە؛ بـۆڕیی گەروو مری

**بابـەلێ / babelê/**: ناو. باوالێ؛ باوکەلێ؛ باوەلێ: ١. نازناوێکی خۆشەویستانە، باب و گەورەتر بۆ بانـگ کردنی گچکـە دەیلـێن ‹بابـەلێ گیـان! چـت بـۆ بێنم؟› ٢. باب؛ باوک ٣. بابەوەلی؛ پیـاوی پـیری ئایینی؛ پیـاوی خـودا ١. بابـایی ٢. پـدر ٣. پیـر پرهیزکار

**بابـەڵباب / babełbab/**: ناو. ١. بـاپیران؛ نەبەتـەر؛ بـــابوکـــاڵان ‹بابەڵبابـــم پێشـــمەرگە بـــوون› ٢. پشتاوپشت؛ پشت بە پشت ‹ئـەو کـسمە بابەڵـباب پێمان گەیشتووە› ١. اجداد ٢. نسل به نسل

**بابەڵێ / babełê/**: ناو. وشەیێک بۆ ئاماژە بە باوکی کەسێ، بە گلە و گازندەوە ‹بابەڵێت وتی وا بکـە؟› باباهه

**بابەنوێل / babenwêl/**: نـاو. کەسـێ لـە ڕواڵـەتی پیرەپیاوێکدا بە بەرگ و کڵاو و شاپۆی سـوورەوە شـەوی جێـژنی لـە دایـک بـوونی مەسـیح، بـۆ منداڵانی مەسیحی جێژنانە دەبا بابانوئل

**بابەوەلی / babewelî/**: ☜ بابەلێ ـ٣

**بابهێر / babihêr/**: ☜ بابوێر

**بـابی / babî/**: ئاوەڵـناو. لـە سـەر دیـنی سـەید

موحەممەد عەلی شیرازی (باب) بابی

**بابی‌ـبابی** / babî babî/: ناو. کەری سوور؛ گەمەیەکی منداڵانە از بازی‌های کودکان

**بابیتانێ** / babîtanê/: ناو. دیلەکانێ؛ جۆلانێ تاب‌بازی

**بابیزۆک** / babîzok/: ناو. لافاو سیلاب

**بابیستانە** / babîstane/: ناو. حەقلی‌مەقۆ؛ هەلەق ـمەلەق؛ ئەمسەرـ ئەوسەر الاکُلنگ

**بابیلان** / babîlan/: ئامراز. وشەی خۆشەویستی بۆ دواندنی منداڵی خۆ، یان لە خۆ گچکەتر بە گشتی جانِ پدر

**بابینۆک** / babînok/: ناو. لالە؛ هەلالە؛ هەراڵە لالە

**بابینی** / babînî/: ناو. هەلامەت؛ ئالامات؛ پەسیو زُکام

**بابییە** / babîye/: ☜ **بابییەت ـ۱**

**بابییەت** / babîyet/: ناو. ۱. بابییە؛ ڕێبازگەی بەهاییەکان ۲. بابێتی؛ باوکێتی ۱. بابیگری ۲. پدری

**بابێ** / babê/: ناو. باوکە؛ بابەلێ؛ وشەی بانگ کردنی باوک بابا

**بابێتی** / babêtî/: ☜ **بابییەت ـ۲**

**بابێنی** / babênî/: ناو. میراتی باب؛ کەلەپووری باوک میراث پدری

**باپاڵێو** / bapałêw/: ناو. ۱. فیلتێری هەوا ۲. جلی ناسک یان کون ـکون ۱. فیلتر هوا ۲. لباس نازک یا مُشبّک

**باپزو** / bapizû/: ناو. ڕنوو؛ کلیلەبەفر؛ ئەو بەفرە کە با دەیماڵێ و لە لاپاڵان سووانەی پێ دەکا برف گردآمده از باد

**باپشکێو** / bapişkêw/: ناو. چینچکەسلاو؛ قینچکەسلاو؛ سیتکەسلاو گُل‌مُژه

**باپۆرە** / bapore/: ناو. بیانی؛ بێوارە؛ نامۆ بیگانه

**باپۆڕە** / bapoře/: ناوەلناو. بێگانە؛ لاوەکی بیگانه

**باپووسکە** / bapûske/: ناو. بابووسکە: ۱. سووتوو؛ بووڵ ۲. کرێوەی بەفر ۱. خاکستر ۲. کولاک

**باپووشکە** / bapûşke/: ناو. بابردەڵە؛ چیلکە و کای نەرم کە با هەڵیدەگرێ خس‌وخاشاک

**باپووک** / bapûk/: ناو. کرێوە و تۆفی بەفر کولاک

**باپەڕ** / bapeř/: ناو. ۱. هەلامەت؛ نەخۆشی لە سەرماوە ۲. ڕەونج؛ دۆخێ کە مرۆ دوای هیلاک بوون و عارەق کردن بە هۆی لە بەر باوە دانیشتن تووشی دەبێ ۳. ئێش و ئازارێک لە بنپاڵدا کە مرۆ بە هۆی ڕاکردنی بێ ئامادەیی و لە ناکاوەوە تووشی دەبێ. هەروەها: **باپەڕ کردن** ۱. سرماخوردگی ۲. چاپدگی ۳. دلپیچه

**باپەسیو** / bapesîw/: ناو. باپەنا؛ پەنابا؛ شوێنێ کە با نایگرێتەوە جای بادپناه

**باپەنا** / bapena/: ☜ **باپەسیو**

**باپیر** / bapîr/: ناو. باوا؛ بابا؛ باپیرە؛ کالک؛ بابەگەورە؛ باوەگەورە؛ باواگەورە؛ باوگەگەورا؛ باوکی باوک یان باوکی دایک پدربزرگ

**باپیران** / bapîran/: ناو. ئەژداد؛ بنەباب اجداد

**باپیرە** / bapîre/: ناو. ۱. ☜ **باپیر** ۲. سەرناوێک بۆ ڕێز لێنان، کاتی بانگ کردنی بەساڵاچوان ۱. ☜ **باپیر** ۲. پدرجان

**باپیرەگەورە** / bapîregewre/: ناو. باوکی باپیر پدرِ پدربزرگ

**باپیری** / bapîrî/: ناو. جۆرێ هەنجیر؛ توخمەک هەژیر نوعی انجیر

**باپیش** / bapîş/: ناو. چاوێشە چشم درد

**باپیشی** / bapîşî/: ناو. بژیشکی چاو چشم‌پزشکی

**باپیڤان** / bapîvan/: ☜ **باپیوان**

**باپیلک** / bapîlik/: ☜ **باپێلیك**

**باپیڤ / babpîv/**: ناوەڵناو. [پەلار] قسەزلی هیچکارە؛ خۆهەڵکێشی بێ‌هونەر ☰ لافزن بیکارە

**باپیوان / bapîwan/**: ناو. باپیڤان؛ هەتیوچە؛ هەتیمچە؛ هەتیم‌چەرەک؛ هەتیم؛ چێشتی باینجان و پیواز و ڕۆن ☰ آش یتیمچە

**باپێچ[1] / bapêç/**: ناو. ١. ژان بە هۆی زگ وەستانەوە ٢. کرێوە؛ بادەوە ☰ ١. دل‌درد ٢. کولاک

**باپێچ[2]**: ☜ باگر

**باپێچک / bapêçik/**: ناو. باپێچەک: ١. گوریس‌پێچ؛ کار و ڕەوتی شەتەک دان؛ توند بەستن ٢. بۆران؛ بابلیسۆک ☰ ١. کارِ محکم بستن ٢. طوفان

**باپێچەک / bapêçek/**: ناو. ١. ☜ باپێچك ٢. ژان و پێچێ کە بە هۆی با کردنەوە، لە ناو زگدا هەست دەکرێت ٣. تیرۆک؛ وەردێنە؛ باپێچەکی نان ☰ ١. ☜ باپێچك ٢. نفخ ٣. وردنە

**باپێشک / bapêşik/**: ناو. بای پێش باران ☰ باد قبل از باران

**باپێکەر / bapêker/**: ☜ بادار-٢

**باپێلیک / bapêlîk/**: ناو. باپیلک؛ گێژەڵووکە؛ گەردەلوول ☰ گردباد

**باپێو / bapêw/**: ناو. ئامرازێ کە لای هاتنی با و توندی و سووکی با شان دەدا ☰ بادسنج

**بات / bat/**: ئامراز. باتی؛ جیاتی؛ لەباتی؛ لەجیاتی؛ لەبری ☰ به جایِ

**باتانی / batanî/**: ناو. بەتانی؛ جاش؛ جام؛ جاجم ☰ جاجیم

**باتر / batir/**: ناو. باتل؛ برگ؛ دارێکی کورتە بە سەرێکی تیژەوە بۆ یاری باترێن ☰ چوبی کوتاه، مانند نیزه در نوعی بازی

**باتران / batran/**: ناوەڵناو. هەڵەخەرج؛ دەسبڵاو؛ دەسبا ☰ ولخرج

**باترزا / batirza/**: ناو. جەژنێکی زستانەی ئێزەدییانە ☰ از اعیاد ایزدی‌ها

**باتری / batrî/**: ناو. قوە؛ قەوە؛ پیل؛ ئامرازی بەرهەم هێنان و ڕاگرتنی وزەی کارەبایی لە وزەی کیمیایی، گەرمایی، ناوەکی یا هەتاوی ☰ باتری

**باتریساز / batrîsaz/**: ناو. وەستای بەشی کارەبای ماشین ☰ باطری‌ساز

**باتریسازی / batrîsazî/**: ناو. ١. کاری باتری‌ساز ٢. شوێنی باتری‌ساز ٣. کاری دروست کردن، شارژ کردن یان چا کردنەوەی باتری ☰ ١تا٣. باطری‌سازی

**باترێن / bat(i)rên/**: ناو. باتلێن؛ یارییەکی گەنجانە کە باتر لە زەوی دەدەن، هەرکەس باترێکەی زیاتر لە زەوین هەڵچەقی، بردوویەتەوە ☰ نوعی بازی با چوبی کوتاه نیزه‌مانند، که چوب هر کس بیشتر در زمین فرو برود برنده است

**باتسکە / batiske/**: ناو. جۆرێ هەنجیر کە زووتر پێ‌دەگا ☰ نوعی انجیر زودرس

**باتسمێ / batismê/**: ناو. جێژنی گەورەی ئێزەدییان ☰ باتسمی؛ عید بزرگ ایزدیان

**باتسی / bat(i)sî/**: ناو. جەژنێکی لەبیرەوەچووی ئێزەدییانە نزیک بە کاتی جەژنی کریسمەس بەڕێوە دەچوو ☰ باتسی؛ از اعیاد کهن ایزدیان

**باتل / batil/**: ☜ باتر

**باتلێن / bat(i)lên/**: ☜ باترێن

**باتڵ / batił/**: ناوەڵناو. بەتاڵ؛ هەڵوەشاو؛ پووچەڵ. هەروەها: **باتڵ بوونەوە؛ باتڵ کردنەوە** ☰ باطل

**باتڵاخ / batłax/**: ناو. زەلکاو؛ زەل؛ زۆنگ؛ چەق؛ باتلاغ؛ باتلاک؛ قوڕەلان ☰ باتلاق

**باتڵاغ / batłağ/**: ☜ باتڵاخ

**باتڵاک / batłak/**: ☜ باتڵاخ

**باتمان / batman/**: ناو. کێشانەیەکە هەمبەری شازدە کیلۆ و نیو (هەزار هەوسار و دەسبەند و گوریسی لێ دروست دەکرێ/ بە سەد باتمان خوری

گەر بیکرێ هەرزانە ئەم ڕیشە! «شێخ ڕەزا»» 🇮🇷 پیمانەای برابر با ۱۶/۵ کیلو

**باتۆڤ / batov/**: ناو. باتوف؛ باتووف؛ باتۆڤی؛ باتۆڤک؛ باتیڤۆک؛ ڕەشەک؛ زەڕنیقە؛ قلینچکە هەوریشە؛ زڕناقە؛ سورناتک؛ سوڕناتک؛ زڕناتک؛ زڕنیکە؛ سرناتک؛ زورناتە؛ چڵچاوکە؛ ناوی گیایەکی خۆڕسکی دەرمانی و لەوەڕگاییە، گوڵەکانی سوور و زەردە و لاسکەکانی سوورە 🇮🇷 گل هزارچشم؛ هوفاریقون

**باتوم / batum/**: ☜ باتۆم

**باتوڤ / batuv/**: ☜ باتۆڤ

**باتۆم / batom/**: ناو. لس؛ لیس؛ باتوم؛ باتوون؛ باستۆن؛ کوڵەتێلایەکی لە دار یان پلاستیک کە پاسەوانان وەک چەکی سارد لەگەڵیانە 🇮🇷 باتون

**باتوو / batû/**: ناو. [شوورەیی] گون؛ گونک ‹باتووی کەر و باینجانی/ لە نەزانی یەک دەزانی «هەژار؛ بۆ کوردستان»› 🇮🇷 خایە

**باتووبەن / batûben/**: ناو. فەتبەن؛ گونبەندی پیاوی قۆڕ 🇮🇷 فتق‌بند

**باتووبەند / batûbend/**: ناو. ئامرازی بەستنی باتوو بەتایبەت بۆ کەسێ کە قۆڕ بووبێت 🇮🇷 خایەبند

**باتوودان / batûdan/**: ناو. هەویج؛ پێستەی گون 🇮🇷 کیسەی خایە

**باتوون / batûn/**: ناو. ۱. شووشکە؛ شیری کورت ۲. ☜ باتۆم 🇮🇷 ۱. شمشیر کوتاه ۲. ☜ باتۆم

**باتوونە / batûne/**: ☜ بەتوونە

**باتەقا / bateqa/**: ☜ بارتەقا

**باتی / batî/**: ئامراز. لە جێگەی؛ لە بری؛ جیات 🇮🇷 بە جای

**باتیزک / batîzik/**: ☜ باتیزۆک

**باتیزۆک / batîzok/**: ناوەڵناو. [پەلار] باتیزک؛ ڕووگرژی خۆبەزلزان 🇮🇷 اخموی خودپسند

**باتیسک / batîsk/**: ناو. ژنخوشک؛ خوشکی ژن 🇮🇷 خواهرزن

**باتینک / batînik/**: ناو. خونچەی تازە پشکوتوو 🇮🇷 غنچەی تازە شکفتە

**باتینۆک / batînok/**: ناو. ڕەبەنۆک؛ گوڵەمێلاقە؛ ئالالە؛ گوڵالەسوورە 🇮🇷 آلالە

**باتێکراو / batêk(i)raw/**: ناوەڵناو. ۱. پفەڵدراو؛ پفدراو؛ فوودراو ۲. [مەجاز] پیاهەڵگوتراوی لەخۆڕا ۳. [مەجاز] قسە فێرکراو و هاندراو 🇮🇷 ۱. پُف دادە ۲. تحسین‌شدەی الکی ۳. تحریک‌شدە

**باج / bac/**: ناو. ۱. پیتاک؛ خەرج؛ ئەو پارەی پیاوی میری لە خەڵکی دەستێنێ ‹تا گێران یاران ئاهووان ڕەم-ڕەم/ باجت وە گەردەن خەراجت وە چەم «مەولەوی»› ۲. تاوان؛ ئەوەی بە ناوی قەرەبوو، هۆز یان دەوڵەتی تێشکاو بە سەرکەوتووی دەدا ۳. بارانە؛ سەرانە ٤. [مەجاز] خاوە؛ ئەوەی بە ملهوڕی دەیستێنن ‹باج لە بار ئەگیرێ «مەسەل»› 🇮🇷 ۱. باج ۲. تاوان ۳. سرانە ۴. باج سبیل

▣ **باجی ڕێ**: ڕێگانە؛ کرێی دەرباز بوون لە ڕێگا یان ئۆتووبان 🇮🇷 عوارض راه

⊡ **باج گرتن**: بارانە سەندن 🇮🇷 باج گرفتن

**باج لێگرتن**: [کینایە] نقورچک لە ئەمانەت یان لە شتی کەسێک دان 🇮🇷 ناخونک زدن

**باجئەستێن / bac'estên/**: ناو. باجسێن؛ باجگر؛ باجەوان؛ ئەوەی باج کۆ دەکاتەوە 🇮🇷 باجگیر

**باجان / bacan/**: ☜ باینجان

**باجاناسور / bacanasûr/**: ناو. تەماتە؛ تۆماتیز 🇮🇷 گوجەفرنگی

**باجانڕەشک / bacanreşik/**: ☜ باینجان

**باجانسۆر / bacansor/**: ناو. تەماتە 🇮🇷 گوجەفرنگی

**باجسێن / bacsên/**: ناو. باجئەستێن 🇮🇷 باجگیر

**باجگر / bacgir/**: ناو. باجەوان؛ ڕادار؛ باجئەستێن 🇮🇷 باجگیر

**باجگرخانه** / bacgirxane/: ناو. قولـخ؛ باجگـه 🇮🇷 باجگیرخانه

**باجگه** / bacge/: ناو. ئەو بنکەی باجگری تێدان 🇮🇷 پست باجگیری

**باجگیر** / bacgîr/: ناو. ۱. ڕێگر؛ ملـهوڕی بـەزۆری پارە لە خەڵک سێن ‹تۆ دلبەری عەییاری لە بازاڕی تەماشا/ باجگیری لە هەر سەڵتەنەت و بـاری هـەموو شـاخ «قـانع»› ۲. ڕادار؛ بـاجئەسـتێن؛ ئـەوی بـۆ دەوڵەت باج کۆ دەکاتەوە 🇮🇷 ۱. باجگیر ۲. باجبگیر

**بـاجوایی** / bacwayî/: ناوەڵناو. [پلار] خاوەن‌مـردوو؛ بێ‌خاوەن؛ جۆرێ تووک، واتا: بریا خاوەنی دەمرد ‹چەن جار وتم ئەم کراسە باجواییە مەکـە بـەرت؟!› 🇮🇷 صاحب‌مُرده

**بـاجوج** / babcuc/: نـاو. [کینایـە] خەڵــکی زۆری تێکەڵ و پێکەڵ 🇮🇷 شلوغی و ازدحام

**باجوج** / bacûc/: ناوەڵـناو. شۆخی‌باز؛ گاڵتەچی 🇮🇷 شوخ

**باجووا** / bacûwa/: نـاو. باجی بە باجی؛ ژنـێ کـە ژن بە ژن کرابێت 🇮🇷 زن معاوضه شده

**باجه** / bace/: نـاو. ۱. ☜ **بـاجی ـ۱** ۲. بۆتکـە؛ گیشە؛ هۆدەیەکی بچووک بۆ فرۆشتنی بلیت یان هەر شتێ 🇮🇷 ۱. ☜ **باجی ـ۱** ۲. باجه

**باجەوان** / bacewan/: ناو. باجئەستێن 🇮🇷 باجگیر

**بـاجی** / bacî/: ناو. ۱. ئاجی؛ باجە؛ خوشکی گەورە ۲. خاتوون؛ خان؛ وتەی بەڕێز دوانـدنی ژنـان ۳. خوشکی مێرد؛ خوشکی شوو ٤. باوەژن ٥. پلەی حەونوتەی مووسیقا 🇮🇷 ۱. خواهر بزرگ ۲. خـانُم ۳. خواهرشوهر ۴. زن‌پدر ۵. گام موسیقی

**باچ** / baç/: ناو. باج 🇮🇷 باج

**باچاندن** / baçandin/: چاوگ. باریکـەوبوون؛ خـۆ دزینـەوە؛ کـووزووبـوون؛ لـە پەنایەکـەوە بـۆی دەرچوون 🇮🇷 جیم شدن

**باچـک** / baçik/: نـاو. ۱. بەلاڵـــووکە کێویلـــە؛ ئالووبالـووی جەنگەڵـی ۲. گەنمەشـامی؛ زڕاتی سوور 🇮🇷 ۱. آلبالوی وحشی ۲. ذرت قرمز

**باچووڕە** / baçûre/: ناو. قسەی ناماقووڵ 🇮🇷 گزافه

**باچـەڕێ** / baçeřê/: نـاو. کاڵــەدڕانە؛ پاداشــی دز کاتێ ماڵی دزیەتی دەداتـەوە 🇮🇷 مُـزد برگردانـدن مال دزدی

**باچیک** / baçîk/: ناو. هەرزن؛ گاڵ 🇮🇷 ارزن

**باحاڵ** / bahał/: ناوەڵناو. ۱. سەرحاڵ؛ سـەرکەیف ۲. خـاوەن ئاکـاری لەبـەردڵان 🇮🇷 ۱. سـرزنده ۲. باحال

**باخ**[1] / bax/: ناو. باغ: ۱. دارستانی میـوە؛ بۆسـان؛ بێستان؛ بیسان؛ ملک ۲. خانەباغ؛ ماڵـی لـە نێـو حەوشی گەورەی پڕ لە گوڵ و گیادا 🇮🇷 ۱. بـاغ ۲. خانەباغی

⊡ **باخ بڕین**: باغ بڕین: ۱. هەرەس کردن؛ بڕین و هەڵپاچینی داری باخ ۲. لە دوژمنایـەتی داری بـاخ بڕینـەوە 🇮🇷 ۱. هَـرَس بـاغ ۲. قطـع کـردن عدوانی درختان باغ

**باخ نیان**: داری میوە نان و پەروەردە کردنی باخ 🇮🇷 درخت مُثمر کاشتن

**باخ**[2]: ناوەڵناو. لە خۆ بایی 🇮🇷 مغرور

⊡ **باخ بون**: لە خۆ بایی بوون؛ لە خۆدەرچوون 🇮🇷 به خود غرّه شدن

**باخات** / baxat/: پێرۆ. ← **باخوباخات**

**باخان** / baxan/: ☜ **باغان**

**باخبڕ**[1] / baxbiř/: ناو. کەسێ کـە کـاری بـڕین و هەڵپاچینی باخ ئەنجام دەدا 🇮🇷 هَرَس‌کنندەی باغ

**بـاخبڕ**[2]: ناوەڵناو. تایبەت بۆ بڕینی لق‌وپـۆ ‹قـەیچی باخبڕ› 🇮🇷 باغبانی

**باخت** / baxt/: نـاو. ۱. ئاکامی دانان لە کێبەرکێـدا ‹بێ بەدەڵەن عومر بافتش هەر پاسەن/ باختش پەی مەعشووق بێ‌بـەدەڵ خاسـەن «داخـی»› ۲. کـار و ڕەوتی خەرج کردن و لە دەس دان 🇮🇷 ۱و۲. باخت

▣ **باخت کردن:** ۱. دۆڕاندن؛ دانان؛ دانیان ۲. لە دەس دەرچوون؛ لە دەس دان ☰ ۱. باختن ۲. از دست دادن

**باخچۆڵە / baxçołe/:** ناو. باخچەی چکۆلانە ☰ باغچەی کوچک

**باخچە / baxçe/:** ناو. باغچە: ۱. بوخچە؛ باغی چکۆلە؛ جێی گوڵ و سەوزی چاندن ‹شکۆفەی باخچەی پیری سفیدەن/ سەرمایەی مێوەی عیرفان هەر ئیدەن «مەولەوی»› ۲. باخچەی ئاژەڵان؛ شوێنی ڕاگرتنی گیانداران بە مەبەستی ئاگاداری لێ‌کردن و نیشان دانیان ۳. باخچەی منالان ☰ ۱. باغچە ۲. باغوحش ۳. مهدکودک

▣ **باخچەی ئاژەڵان:** ☜ **باخچە ـ۲**

**باخچەی منالان:** باغچەی ساوایان؛ دامەزراوەیەک بۆ ئاگا لێ‌بوون و ڕاهێنانی منداڵانی ۳ تا ۵ ساڵان لە چەن کاتژمێری ڕۆژدا ☰ مهدکودک

**باخچەوان / baxçewan/:** ناو. ئاگاداری باخچە ☰ باغچەبان

**باخدار / baxdar/:** ناو. باغدار: ۱. باخەوان؛ چاودێری باخ ۲. خاوەن باخ ☰ ۱. باغبان ۲. باغدار

**باخداری / baxdarî/:** ناو. باغداری: ۱. باخەوانی ۲. خاوەنداریتی باخ ☰ ۱. باغبانی ۲. باغداری

**باخڵە / baxłe/:** ناو. ۱. توربێن؛ تۆمدان؛ تۆمەدانە؛ خورجی تۆودان ۲. خەزانە؛ دووکانە شەتڵ؛ عەمارە شەتڵ؛ کەرتە زەمینێ تۆوی تێدا دەچێنن بۆ شەتڵ ☰ ۱. توبرەی برزگران ۲. انبار نشا

**باخن[۱] / baxin/:** ناو. بابوێر؛ کونەبا؛ شوێنێک کە بای لێوە دێ ☰ منفذ باد

**ـ باخن[۲]:** پاشەوشە. ـــ پەستێن؛ کۆکەرەوە؛ خڕکەرەوە ☰ ـ اندوز

**باخوا / baxiwa/:** ئاوەڵناو. دیندار؛ خواناس ☰ باخُدا

**باخواردو / bax(i)wardû/:** ئاوەڵناو. پێچراو ☰ تابیده

**باخوباخات / bax û baxat/:** ناو. شوێنی پڕ گوڵ و دار و سەوزەڵانی ‹فەڵەک پڕ گریە بێ، تا چاوی هەوری لێڵ و تاریکی/ زەمین پڕ خەندە بێ، تا لێوی غونچەی باخوباخاتی «بێخود»› ☰ باغات

**باخوران / baxuran/:** پێرۆ. ← **زاخوران‌باخوران**

**باخوێ / bax(i)wê/:** ناو. ۱. خوا؛ خودا؛ خودێ ۲. دۆست؛ هەڤال ۳. لەبار؛ باوخۆش ☰ ۱. خدا ۲. دوست ۳. خوشدست

**باخۆخ / baxox/:** ناو. کەنێژە؛ ئانگەلۆک؛ هێشووی گەنم ☰ گُل گندم

**باخۆر / baxor/:** ناو. بابوێر؛ کەلێنی بچووک کە بای لێوە دێ ☰ بادآهنگ

**باخۆش / baxoş/:** ئاوەڵناو. سەرتر دە کایەدا ☰ ماهرتر در بازی

**باخۆشە / baxoşe/:** ناو. کەوچک یان دارێکی پان بۆ شێواندنی چێشت ☰ همزن آش

**باخە[۱] / baxe/:** ناو. ۱. ☜ **باقە ـ۱** ۲. جۆرێ نەخۆشی سمی یەکسم ۳. باغە؛ ماکێکی دەسکرد ‹تەسبێحی باخە› ☰ ۱. ☜ **باقە ـ۱** ۲. از بیماری‌های دام ۳. کائوچو

**باخە[۲]:** ئاوەڵناو. دەنگ‌کەوتوو؛ دەنگ‌نووساو ☰ گرفته (در مورد صدا)

**باخەبێن / baxebên/:** ☜ **باقەبەس**

**باخەخواز / baxexiwaz/:** ناو. کەسێ کە بە خەرمانانەدا دەگەڕێ و باخە گەنمی بە خێر دەدەنێ ☰ خوشەچین

**باخەگوڵ / baxeguł/:** ناو. گولستان؛ گوڵزار ☰ گلزار؛ گلستان

**باخەل / baxel/:** ☜ **باخەڵ**

**باخەڵ / baxeł/:** ناو. باخەل: ۱. بەر؛ بەرۆک؛ پاخل؛ نێوانی سنگ و کراس ۲. باوەش؛ ئامێز ۳. گیرفان؛ گیفان ☰ ۱. بر ۲. آغوش ۳. جیب

▣ **لە باخەڵدا بوون:** لە باڵدا بوون؛ هاوژین بوون؛

هاوسەر بوون ‹کچەکەی حاجی ڕەسوولی لە باخەڵدایە› ☰ در کابین داشتن

**باخەڵبڕ** / baxełbiř/: ناو. باغەڵبڕ؛ گیرفانبڕ ☰ جیببُر

**باخەڵە** / baxełe/: ناو. پاخەڵ؛ گیرفان ☰ جیب

**باخەوان** / baxewan/: ناو. باغەوان؛ ناتۆر؛ ناهتۆر؛ ئەوەی ڕەز و داری میوە بەخێو دەکا ‹سوبحی فەروەردینە ئەمرۆ، بولبولی دڵ بێخەمە/ گەر لە خۆشییا گیانی دەرچێ باخەوان، هێشتا کەمە «بێخود»› ☰ باغبان

**باخەوانی** / baxewanî/: ناو. باغەوانی: ١. زانستی پەروەردە کردنی باخ ٢. کاری چاندن و پەروەردە کردنی گوڵ و دار و گیا لە باخدا ☰ ١. دانش باغبانی ٢. شُغل باغبانی

**باخیر** / baxîr/: ناو. خەبەرهێن؛ بەرسەفهێن ☰ خبررسان

**باخیرە** / baxîre/: ناو. ١. بۆران؛ با و کڕێوە ٢. گەمیە؛ کەشتی ☰ ١. بوران ٢. کشتی

**باخیە** / baxye/: ☜ بەقیە

**باد** / bad/: ناو. با: ١. دۆخی شنانەوە و بزوانی هەوا ‹قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خوەش مورور/ ئەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری شارەزوور «نالی»› ٢. خول؛ پێچ ‹سەر لەتەرەی خەم خول ئاوەردەوە/ تای کرژ مەینەت دووباد کەردەوە «مەولەوی»› ☰ ١. باد ٢. پیچ

**بادار** / badar/: ناوەڵناو. ١. تووشیاری نەخۆشیی باداری ‹ماوەیەکە بادارە، جووڵانی حەستەمە› ٢. باپێکەر؛ واکەر؛ بەدیهێنی با لە ناو ڕیخۆڵەدا ‹نۆکی کوڵاو بادارە، مەخۆ!› ٣. /پەلار/ لووتبەرز؛ ترزل ☰ ١. رُماتیسم ٢. نفخ‌آور ٣. پُرافاده

**بادارۆک** / badarok/: ناو. گوڵەسەر؛ دەسریلەی سەری منالی ساوا ☰ دستمال سر نوزاد

**باداری** / badarî/: ناو. ڕۆماتیسم؛ ژان و ژوو؛ ژانژوو؛ ژونرۆ؛ سقانژان؛ ژانباد؛ نەخۆشی و ژانی جومگە؛ زاراوەیێ بۆ ئەو نەخۆشییانەی کە لایەنی هاوبەشی هەموویان ژان و تێکچوون، ڕەق بوون و ماسینی ماسوولکە و جومگەی لەشە ☰ رُماتیسم

**باداک** / badak/: ناو. لاولاو ☰ پیچک

**بادام** / badam/: ناو. بادەم؛ بام؛ باوام؛ بایەم؛ بایام؛ بایەو؛ باوی؛ بایەڤ؛ وادام؛ وایدم؛ وایم؛ باو؛ باڤی؛ بایم؛ بایی؛ وامی؛ باهیر؛ باهیڤ؛ بەهێڤ؛ بەهیڤ؛ بەعیڤ: ١. دار یان دارچکێکی گەلاتاکی هێلکەیی درێژۆکەیە بە گوڵی جوانی پەمەیی یان سپی و میوەی ناوکدارەوە ٢. بەری ئەو دارە کە بە تازە، شینی کوڵکنە و وردە ـ وردە توێکڵی ڕەق هەڵدێ و ناوکێکی چەوری خۆراکی دەکا ☰ ١. درخت بادام ٢. بادام

◙ **بادامی سوختە**: جۆرێ شیرینی کە بە شەکری تواوە و بادام یان بادام زەوینی دروست دەکرێ ☰ بادامسوختە

**بادامی کاغەزی**: بادامە گەڵوازە؛ وامە وەشێ؛ بادام کاغەزی؛ پستەبایەم؛ پستەبەهێڤ؛ بادامی شیرین بە تێکوڵی ناسک و تورتەوە ☰ بادام کاغذی

**بادامی کێوی**: ئارژەنگ؛ ئەرژنگ؛ ئارژنگی؛ ئەرجن؛ هەرجن؛ هەرجانە؛ چڵدسە؛ بادامە کێفیلە؛ وامە کەشێ؛ جۆرێ بنچکە بادامی خۆرسکە ☰ بادام کوهی

**بادامچە** / badamçe/: ناو. فەریکە بادام؛ چەقالە بادام ☰ چغالە بادام

**بادامزەوینی** / badamzewînî/: ناو. بەهێڤەشامی؛ وەنەشامی؛ زرفستەق؛ پستەزەوینی؛ بادامەعەرزیلە؛ بادامەزەمینە: ١. گیایەکە لە بنەماڵەی باقلە و نۆک، گوڵەکانی زەردە و کاتێ نێر و مێی دەکەن شۆڕ دەبنەوە و بە نێو زەویدا دەچن و دەبنە کەلووی بادامزەمینی ٢. دەنکی

ئـەو گیایــە ▪ ١. بوتـەی بـادامزمینـی ٢. هسـتەی بادامزمینی

**بادامه** / badame/: نـاو. ئالــوو؛ ئالــک؛ لکمــل ▪ لوزتین

**بادامەتاڵە** / badametałe/: نـاو. بادامی تاڵ؛ وامـە تاڵــێ؛ بایەمەتاڵــە؛ چوالەتاڵــە؛ بەهیڤــەتەحلە؛ بایەمەکەتانی ▪ بادام تلخ

**بادامەزمینە** / badamezemîne/: ☜ بادامزەوینی

**بادامەعەرزیلە** / badame'erzîle/: ☜ بادامزەوینی

**بادامەکێویلە** / badamekêwîle/: ناو. ئاژک ▪ بادام کوهی

**بادامی** / badamî/: ئاوەڵناو. بادامین: ١. وەک بادام ‹بە حەیرەت لەو گوڵەندامەم کە وا بادامییــە چـاوی/ دڵی نازک وەکوو گوڵ، هەم ڕەقە وەک توێکڵی بـادام «مـەحوی»› ٢. بــادامین؛ وامینــە؛ بــە بادامــەوە ‹شیرینی بادامی› ▪ ١و٢. بادامی

**بادامین** / badamîn/: ☜ بادامی

**بادامێو** / badamêw/: ناو. بارۆشە؛ پەنکە ▪ پَنکە

**باداوە** / badawe/: ناو. تۆف؛ کرێوە؛ باکوت؛ بادەوە ‹ئەتانبینن: حووتی تۆفان بـە دەم بـاداوەی زەردەوە، ئەتانبات و ئەتانهێنێ «شێرکۆ»› ▪ کولاک

**بــادراو** / bad(i)raw/: ئاوەڵــناو. پــێچخــواردوو؛ پێچدراو؛ بادریاگ ‹زاهیـد کـە سـەیری پەرچـەمی ســونبول ئــەکا، ئەڵــێ/ ئــەم ڕشــتە بــادراوە لــە حەبلولمەتین ئەکا «بێخود»› ▪ تابخوردە

**بادراوی** / bad(i)rawî/: ناو. گرژی ▪ تابخوردگی

**بادرز** / badirz/: نـاو. کەڵێنی تەنگی بابوێر ▪ منفذ باد

**بــادرو** / bad(i)ru/: نــاو. گـــــوڵمـــــەخموور؛ پۆپەکەڵەشێرە؛ گوڵی پۆ؛ گوڵێکی سووری چەنـد پەلکە، لە پۆپەی کەڵەباب دەکا ▪ گُل تاجخروس

**بادرۆخ** / bad(i)rox/: ☜ بابوێر

**بــادرو** / badirû/: نـاو. ســوارۆک: ١. بنەماڵــەی پۆپەکەڵەشێرە کە لە دێبەر و پارکەکان بۆ جوانی پــــەروەدەی دەکـــــەن ٢. گوڵــــەمەخموور؛ گوڵعاشقان؛ گوڵبادروو؛ گوڵـی ئـەو ڕوەکـە بـە ڕەنگــی ســووری پەمــەیی و بنەوشــەوە ▪ ١و٢. تاجخروس پرورشی

**بادرەوش** / bad(i)rewş/: ☜ بابوێر

**بادریاگ** / badiryag/: ☜ بادراو

**بادرێزە** / badřêze/: ناو. بارێزە ▪ میوەی بادریختە

**بادرێسە** / badřêse/: ناو. ١. سەرتەشی ٢. فرفـرە؛ فرفرۆکــە ٣. دەوار ٤. کۆمــاج؛ هــەورەبان ▪ ١. سردوک ٢. فرفرە ٣. چادر ۴. خرپُشتە

**بــادکێش** / badkêş/: نـاو. باکــەش؛ کەڵەشــاخ ▪ بادکِش

**بادگیرە** / badgîre/: ناو. شتێ کە پێش بە با بگرێ ▪ بادبُر

**بــادە** / bade/: نـاو. ١. مــەی؛ شــەراو ‹تـۆ مەسـت بادەی دەردئەفکەن مەیل/ من حەیران دەس نیگـای باڵای لەیل «مەولەوی»› ٢. گشتە؛ کرژە ▪ ١. بادە؛ می ٢. ریسیدە

**بادەخۆر** / badexor/: ناو. عارەقخۆر ▪ عرقخور

**بــادەر** / bader/: نـاو. ١. کرژکــەر ٢. جــەڕبادەر؛ پێچگووشی ▪ ١. ریسندە ٢. پیچگوشتی

**بادەڤ** / badev/: ناو. کـرێوە؛ بـادەوە؛ بـۆران؛ بـا و بەفر پێکەوە ▪ کولاک

**بادەقوش** / badeqûş/: ☜ بایەقوش

**بــادەک** / badek/: نـاو. ١. ئاچــەر ٢. جــەڕبادەر؛ پێچگوشتی ▪ ١. آچار ٢. پیچگوشتی

**بادەڵان** / badełan/: ئاوەڵناو. *[ڕبلار]* هەڵـەخەرج ▪ ولخرج

**بادەڵێن** / badełên/: ئاوەڵناو. بـادەر؛ بـا ڕانـەگر ▪ نشت دهندەی باد

**بادەم** / badem/: ☜ بادام

**بادەمەک** / bademek/: ناو. لـووی ژێـر پێسـت ▪

غُدّه

**بادەنۆشی / badenoşî/**: ناو. شەرابخۆری؛ کار و ڕەوتی مەی خواردنەوە. هەروەها: **بادەنۆش** ☰ بادەنوشی

**بادەوان / badewan/**: ناو. بایەوان؛ یەلکەن؛ یەرکەن؛ چارۆکەی ئەو گەمیانەی بە هێزی با دەبزوێن ☰ بادبان

**بادەوە / badewe/**: ناو. ١. باوەە؛ کرێوە؛ بارشتی بەفر بە باوە ٢. بایەوانی گەمیە ٣. بەرزەحەوایلە؛ کۆلارەی لە قاقەزی منداڵان ☰ ١. کولاک ٢. بادبان ٣. بادبادک

**بادی / badî/**: ☜ **بایە**

**بادیلە / badîle/**: ناو. جامی بچووک ☰ ظرف کوچک

**بادیە / badîe/**: ☜ **بایە**

**بادیهەڤا / badîheva/**: ☜ **بادیهەوا**

**بادیهەوا / badîhewa/**: ناو،ئاو. بادیهەڤا: ١. خۆڕایی؛ مفت؛ فیڕۆ ‹ــ لەم بەش ـ بەشێنە کوردیشی تیایە؟/ ـ پیرۆت ئەم قسیەت بادیهەوایە! «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ٢. خۆبایی؛ بە فیز و دەعیە و لەخۆدەرچوو ☰ ١. مُفت ٢. متکبر

**بادیهەوایی / badîhewayî/**: ناو. خۆبینی؛ خۆپەسندی؛ فیز ☰ تکبر

**بار[1] / bar/**: ناو. ١. هەر شتێکی ڕاگواستنیی بێجگە مرۆ ٢. ئەوەندە لە شتێک کە بە جارێک بگوازرێتەوە ‹دوو بار شووتی› ٣. */مەجاز/* ئەرک و زحمەت ‹مەجنوون کەی چوون من بار دەرد تاوان/ کەی دووی دەماخش وە گەردوون یاوان «بێسارانی»› ٤. بەر؛ میوە؛ بەرهەم ‹کەرەم خودا، ئەو دارە هێندە باری گرتووە، لقەکانی داهاتوون!› ٥. */کینایە/* تۆل؛ منداڵی ناو زگ ‹پوورە حەبێ باری هەیە› ٦. پەلاس؛ بۆخ و سپیایی لە سەر زمان ‹زمانم باری گرتووە› ٧. قەتماخە و ڕەشایی لە سەر لێو ‹لەعلی شەککەرباری تۆ تێراوە، شەککەر بارییە/ لێوی میحنەتباری من بێئاوە، باری گرتووە «نالی»› ٨. مەیخانە؛ شوێنی ڕانان و خواردنەوەی مەی ٩. تاوان؛ قەرەبوو ‹من باری جگی خۆم لە تۆ دەوێ› ١٠. قورسایی؛ گوشار ‹ئەم میچە قورسە، نابێ باری بکەوێتە سەر ئەم کۆڵەکە باریکە› ١١. ساز و تەیاری؛ گونجاوی؛ شیاوی ‹ئەم کارە لە بارایە› ١٢. بەرپرسایەتی ‹تا ژنت نەهێناوە، هیچ بارێکت لە سەر نییە› ١٣. شان؛ پلە و پێگە ‹سەروەرا! ئەم کارە، کاری تۆ نەبوو/ یان بڵێم ئەم بارە، باری تۆ نەبوو «قانع»› ١٤. کۆچ ‹پارەکە لێرە باریان کرد› ١٥. دۆخ؛ حاڵ؛ چۆنیەتی ‹وڵات لە بارێکی خراپدایە› ١٦. لایەن؛ ئالی؛ لا ‹ئەم بار و ئەو بار کردن› ١٧. */مەجاز/* چۆنیەتی ژێهاتی بۆ هەبوونی شتێک ‹کە بێتە باری دەمبازی و قسەی زل ـ زل لە مەجلیسدا/ وەکوو قانع بە قوربانی شوانی هۆزی کوردانم «قانع»› ١٨. */مەجاز/* ڕێ و ڕەوش؛ شێوازی جێبەجێ کردنی کارێک ‹ئەو کارە وا نابێ، تۆ لە بارەکەی نازانی› ١٩. دۆخی ئاسایی ‹ئا، ئێستا باری خۆیە› ٢٠. باری کارەبایی ٢١. */مەجاز/* خەم؛ پەژارە ‹نەخۆشی تۆ باری سەر دڵی منە› ٢٢. بەخت ‹بابایەکی بار کەوتووم، بۆم نایە› ☰ ١. بار (قابل حمل) ٢. بار (محموله) ٣. زحمت ۴. میوه ۵. جنین ۶. بارِ زبان ٧. خُشکەی لب ٨. میخانه ٩. تاوان ١٠. وزن ١١. آمادگی ١٢. مسئولیت ١٣. شأن ١۴. کوچ ١۵. وضعیت؛ کیفیت ١۶. طرف ١٧. جنبه ١٨. روش ١٩. حالت طبیعی ٢٠. بار الکتریکی ٢١. اندوه ٢٢. بخت

▣ **بارا خودێ**: */کینایە/* زەکات؛ بەش یا پشکا خودێ ☰ زکات

**باری خەم**: ناڕەحەتی و خەفەت ‹من چی بکەم لە دەس باری خەمەوە؟/ گۆشەی دڵ لە لای کێ بکەمەوە؟ «فولکلۆر»› ☰ بار غم

**باری سەرشان**: ئەرک ☰ مسئولێت

**باری لا:** باری خوار و نالەبار ☰ بارِ کج
**باری نائاسایی:** دۆخی بەراورد نەکراو/ کتوپڕی ☰ حالت فوق‌العاده
⊡ **بار بردن:** ۱. بار کێشان ۲. بار دزین ۳. هەڵکردن و لێ‌قەبووڵ کردن ☰ ۱. حمل کردن ۲. دزدیدن محموله ۳. تحمل کردن
**بار بەستن:** ۱. تێک‌نانی ئەسپاب و کەل‌وپەلی سەفەر ۲. *[کینایە]* بە پووڵ و پارە گەیین و جێی خۆ قایم کردن لە ژیاندا ☰ ۱. رخت سفر بستن ۲. بار خود را بستن
**بار خستن:** ۱. پشوودانی کاروان ۲. بێچوو لە بەر چوون ۳. داخستنی بار ‹ئەو هێسترە بارەکەی خست› ☰ ۱. اتراق کردن کاروان ۲. بچه انداختن ۳. انداختن بار
**بار دابەستن:** دانان، دامەزراندن و توند پێچانی بار ☰ بار بستن
**بار داگرتن:** ۱. دەفر پڕ کردن بە نیازی بار کردن ۲. هێنانە خواری بار ☰ ۱. پُر کردن ۲. بار را پیاده کردن
**بار دان:** بار کردن؛ سوار کردنی بار بۆ گواستنەوە ☰ بار زدن
**بار ڕاست کردنەوە:** ۱. لە باری خوار هەڵێنان ۲. *[کینایە]* وە فریا کەوتن ۳. هەڵساندنەوەی بار بۆ نانە سەر بارەبەر ☰ ۱. راست نمودن بارِ کج ۲. یاری رساندن ۳. آماده کردن بار برای بارزدن
**بار سوک کردن:** ۱. لە باری بارەبەر کەم کردنەوە ۲. *[کینایە]* زەحمەت و دەرد لە سەر خەڵک کەم کردن ☰ ۱. از بار باربر کاستن ۲. کمک کردن
**بار کردن:** ۱. بار لە سەر پشتی بارەبەر دانان ۲. کۆچ کردن ‹کاروان هەموو باری کرد و ڕۆشتن، تۆش/ خۆت گورجەوە کە! ڕۆیینت نزیکە «بێخود»› ۳. دانە پاڵ ‹زۆرێک قسەی ناخۆشی بارم کرد› ٤. *[کینایە]* خولتەی درۆ بە یەکێک کردن ☰ ۱. بار کردن ۲. کوچ کردن ۳. نسبت دادن ۴. هندوانه زیر بغل زدن
**بار کەوتن/ کەفتن:** *[کینایە]* بەخت کەوتن؛ بۆ نەهاتن؛ تووشی نزوولی بوون ☰ بد آوردن
**بار کێشان:** ۱. زەحمەت بۆ دیتران کێشان؛ ئەرکی خەڵک وە ئەستۆ گرتن ۲. جێبەجێ کردنی بار ‹دوای هۆڵە نۆرەی بار کێشانە› ☰ ۱. بار مردم را بدوش کشیدن ۲. جابەجا کردن
**بار لێنان:** ۱. کۆچ کردن؛ باری سەفەر بەستن ۲. بارکێشان بە بارەبەر ‹جاشەکە ساڵێ‌تر باری لێ‌ئەنین› ☰ ۱. کوچ کردن ۲. بار بر مرکب زدن
**بار نەبردن:** ۱. هەڵ‌نەکردن؛ گوزەران نەکردن لەگەڵ کەسێ ۲. *[کینایە]* یاخی بوون؛ سەربزێوی کردن ☰ ۱. تحمل نکردن ۲. سرکشی کردن
**بار هاتن:** ۱. هەڵکەوتن؛ خوو گرتنی ڕۆژانی منداڵی ۲. پەروەردە بوون ۳. ڕەخسان؛ لوان ‹هەر باری نەهات بچین› ☰ ۱. بار آمدن ۲. پرورش یافتن ۳. جور شدن
**بار هێنان:** پەروەردە کردن ☰ پرورش دادن
**بە بارێکدا خستن:** *[کینایە]* یەک‌لا کردنەوە؛ بە لایەکدا خستن؛ کار بڕینەوە ☰ تکلیف را روشن کردن
**لە بار چوون:** لەبەر چوون؛ لەناو چوونی تۆل. هەروەها: **لە بار بردن؛ لە بار خستن** ☰ سقط شدن
**بار**[۲]: ئاوەڵکار. زۆر ‹بارەک سەلام لە بابت بکە!› ☰ بسیار
**- بار**[۳]: پاشەوشە. ۱. - ڕێژ؛ بارین ‹خوێنبار› ۲. -کێش ‹خەمبار› ۳. خاوەن؛ هەڵگر ‹تاوانبار› ☰ ۱. بارنده ۲. حاوی ۳. صاحب
**- بار**[٤]: پاشگر. ۱. - ئاسا؛ وەک ‹زرێبار› ۲. شوێن

‹ڕۆبار؛ جۆبار› ٣. پۆڕ؛ هەنجار ‹لەبار؛ نالەبار› ☰ ١. ـ سا ٢. جا ٣. هنجار

**بارئەنداز / bar'endaz/**: ناو. باروزگا؛ بارەنداز؛ بارەناز؛ جێگەی خستنی بار ☰ بارانداز

**باراز / baraz/**: ئاوەڵناو. فێڵباز؛ گزیکار؛ ساختەچی ☰ حیلەگر

**باراش / baraş/**: ناو. بارە دەخڵێ کە بۆ هاڕین دەبرێتە ئاسیاو ‹دە چاک بزانن!/ کوردستانی ئێمە ئاشە و/ سەرکردەکانیشی ئاشەوان/ کورد باراشە و/ هاڕینەکەی بە قونتەرات/ دراوە بەوان! «پەشێو»› ☰ باری کە بە آسیاب برند

⊡ **باراش لێکردن**: ١. باراش لە ئاش کردن ٢. /کینایە/ تێهەڵکردن و درێژە دان بە قسە ‹ئازاد باراشی لێکردووە و تازە نایبڕێتەوە!› ٣. /کینایە/ خۆ تەیار کردن بۆ ڕۆیشتن یان دەست بە کارێکەوە دان ‹نۆبەتە! باراش لێکە! ئاشی گێتی کەوتە گەڕ/ شێر نەترساوە لە بەزم و شۆڕشی مەیدانی شەڕ «قانع»› ☰ ١. غلّه در آسیاب ریختن ٢. بی وقفه سخن گفتن ٣. آمادەی کاری شدن

**باران[1] / baran/**: ☜ بارین

**باران[2]**: ناو. واران؛ ڤاران؛ یاخر؛ یاخەر؛ ئاوێ کە لە ئاسمانەوە بە تنۆکە دێتە خوار ‹دیسان بارانە نم ـ نم تەڕمی کرد/ لەنجە و لارەکەت لە دین دەرمی‌کرد «فولکلۆر»› ☰ باران

⊡ **بارانی پەڵە**: یەکەم بارانی بەقەوەت لە سەرەتای پاییزدا کە دەبێتە هۆی خووسانی ناخی زەوی ☰ نخستین باران جدّی پاییز

⊡ **باران بارین**: هاتنە خوارەوەی تنۆکە ـ تنۆکەی ئاو لە ئاسمانەوە ☰ باران باریدن

**باران تێکردن**: دەسپێکردنی باران ☰ شروع بە باریدن کردن

**باران خۆش کردنەوە**: باران وێستانەوە؛ باران وێسیان ☰ قطع شدن باران

**باران داکردن/ دادان**: دەسپێکردنی باران ☰ شروع شدن باران

**ـ باران[2]**: پاشەوشە. بارینی بەردەوام ‹تۆپباران؛ بەردەباران› ☰ ـ باران

**باراناو / baranaw/**: ناو. ١. ئاوی باران ٢. ئاوی ڕاوەستاوی باران لە قووڵکەدا ☰ ١. آب باران ٢. آب جمع شدەی باران

**بارانبڕان / baranb(i)řan/**: ناو. بارانەوبڕان؛ جۆزەردان؛ ئاخر و ئۆخری بەهار کە هەڕەتی باران بارین نامێنێ ☰ موسم قطع شدن باران

**بارانپێو / baranpêw/**: ناو. ئامرازی دیاری کردنی ڕادەی باران لە ماوەیەکی دیاریکراودا ☰ باران‌سنج

**باران‌داکەر / barandaker/**: ئاوەڵناو. وارێن؛ بارێن ☰ بارندە

**باراندن / barandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //باراندت؛ دەبارێنی؛ ببارێنە// باراندن؛ وارنای؛ داڕژاندن؛ لە بەرزییەوە پرژاندن ‹کوڵم هەڵدەستێ ئەم جارە و لەبەر دەردم دەناڵێنم/ هەتا ئاوری دڵم دەکوژێتەوە، ئەسرین دەبارێنم «هێمن»› ☰ بارانیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەباراندن

**بارانڕست / baranřist/**: ئاوەڵناو. نەوەندە؛ بە باران ڕواو ‹گەنم› ☰ با آب باران روییدە (گندم)

**بارانگر / barangir/**: ئاوەڵناو. بەر باران؛ وەها کە باران بیگرێتەوە ☰ باران‌گیر

**بارانن / baranin/**: ☜ باراندن

**باراننەگر / barannegir/**: ناو. بێلا؛ ئەنوا؛ هەیوان ☰ تراس

**بارانە / barane/**: ناو. ١. باران؛ واران ‹هەوری ڕەشی دێنێ/ بارانەی دەپرژێنێ/ لێم زیزە و نامدوێنێ «فولکلۆر»› ٢. ئەو باجەی باجگر بۆ هەر بارێک دەیسێنێ ٣. ئەو کرێیەی لە خاوەن بار وەردەگیرێ لە بری ڕاگرتنی بارەکەی لە بارخانە و کاروانسەرا و ...دا ☰ ١. باران ٢. باج بار ٣.

کرایەی نگهداری بار

▣ **بارانەی سەر بە قەپوچکە:** ☜ **بارانی سەر بە کڵاوە**

**بارانەی سەر بە کڵاوە:** *[مەجاز]* بارانی سەر بە قەپوچکە؛ بارانی کڵاو بە سەرە؛ گۆپاڵە باران؛ کڵاو بەسەرە؛ ڕێژنە بارانی توند؛ بارانی دەنک گەورە و توند ▤ رگبار شدید باران

**بارانی کڵاو بە سەرە:** ☜ **بارانی سەر بە کڵاوە**

**بارانەڕۆژ / baraneřoj/:** ناو. ڕۆژێ کە سەرلەبەری باران بباریێ ▤ روز بارانی

**بارانەساڵ / baranesał/:** ناو. تەڕەساڵ؛ تەڕساڵ؛ ساڵی زۆر بە باران ▤ آبسال

**بارانەوبڕان / baranewb(i)řan/:** ☜ **بارانبڕان**

**بارانی[۱] / baranî/:** ناو. باڵاپۆشی باران دانەدەر ▤ پالتو بارانی

**بارانی[۲]:** ئاوەڵناو. تایبەت بە باران ‹هەوری بارانی› ▤ بارانی؛ بارانزا

**بارباج / barbac/:** ناو. باجێ کە لە هەر کۆڵ و هەر بارێ دەستێنرێت ▤ باجِ بار

**باربارانێ / barbaranê/:** ناو. باربارکێ؛ بارەخوێیانێ؛ کۆڵکۆڵێن ▤ از بازی‌های نوجوانان

**باربارکێ / barbarkê/:** ☜ **باربارانێ**

**باربوو / barbû/:** ناو. باروبوو؛ باروو؛ بارەبوو؛ بارەبێ: ۱. یارمەتی دانی هەژار و پەککەوتە بە پووڵ و ماڵ لە لایەن هاوسا و هاوماڵانەوە ۲. بارە؛ قەرەبوو؛ کاری کردنەوە جێ ▤ ۱. گُلریزان ۲. جُبران

▣ **باربوو کردن:** ☜ **باربوو کۆ کردنەوە**

**باربوو کۆ کردنەوە:** باربوو کردن؛ خڕکردنەوەی یارمەتی خەڵک بۆ کەسێ یان کارێ ‹کەوتمە باربوو کۆ کردنەوە؛ یان بڵێم سواڵ کردن [بۆ شۆڕش]، نزیکەی شەشسەد لیرەم پێکەوە نا ... «هەژار، چێشتی مجێور»› ▤ کمک جمع کردن

**باربە / barbe/:** ناو. بەیرەم؛ لۆسە؛ ملغە؛ نوێڵ ▤ اهرم

**باربەر / barber/:** ناو. بارەبەر: ۱. چوارپای باری ۲. کۆڵبەر ▤ ۱. حیوان باری ۲. حمّال

**باربەری / barberî/:** ناو. ۱. بارگوێزی؛ بنکەیەک کە کاری بردن و گوێزانەوەی بارە ۲. کۆڵبەری ▤ ۱. باربری ۲. حمّالی

**باربەژن / barbejin/:** ناوەڵناو. سیحرباز؛ جادووکار ▤ جادوگر

**باربەژنگەر / barbejnger/:** ناو. جادووگەر؛ جادووباز ▤ جادوگر

**باربەست / barbest/:** ناوەڵناو. باربەستە؛ ئامادەی سەفەر ▤ مهیای سفر

**باربەستە / barbeste/:** ☜ **باربەست**

**باربەن / barben/:** ☜ **باربەند**

**باربەند / barbend/:** ناو. باربەن: ۱. گوریسی بار پێچان ۲. جێی بار دانان لە سەر ماشین ۳. بەهاربەند؛ تەویلەی سەرنەگیراوی هەڵبەستراو بۆ یەکسم ٤. تەرک یان شوێنی بار لە سەر دانان ▤ ۱. طناب باربندی ۲. باربندِ اتومبیل ۳. بهاربند ۴. تَرک

**باربەندی / barbendî/:** ناو. باربەنی؛ کاری پێچانەوەی باروبنە ‹خێڵخانەی خەفەت باربەندیش کەردەن/ مەینەت ڕوو نیان وە ماوای مەردەن «مەولەوی»› ▤ باربندی

**باربەنی / barbenî/:** ☜ **باربەندی**

**بارتەقا / barteqa/:** ناو. باتەقا؛ هەمبەر؛ بەرانبەر ‹بارتەقای دە پووتێک دەبوو، نازانم چۆنی بۆ هەڵگیرابوو؟! «زەبیحی»› ▤ اندازه

**بارتەقای / barteqay/:** ئامراز. بەقەد؛ ئەوەندەی؛ هێندی؛ بە قەدەری ‹مامۆستا ئەلبیر! بتخەینە تەرازوو، بارتەقای دە منداڵی کورد دێیەوە؛ بۆ دەبێ ئەوان نەترسن و تۆ بترسی؟! «هەژار، چێشتی مجێور»› ▤ بە اندازەی

**بارچەوت** / barçewt/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* بێ‌ئاکار؛ ناڕاست ☚ کجرو

**بارچەوتی** / barçewtî/: ناو. ١. بارلاری؛ دۆخی لار بوونی بار ٢. *[کینایە]* ناڕاستی؛ نەگونجاوی ☚ ١. بار کجی ٢. کجروی

**بارخانو** / barxanû/: ناو. بارخانی؛ بنەڕەت؛ هیم؛ خیم؛ بناغە ☚ اساس؛ شالوده

**بارخانە** / barxane/: ناو. ١. کەڵوپەلی بازرگانی ٢. باری لە سەر یەک هەڵچنراو ٣. *[کینایە]* نامەی کردەوە؛ نامەیەک کە وەک دەڵێن دوو فریشتەی سەر شان، کردەوەی تێدا دەنووسن ‹تۆنی فەریادڕەس، مەعبوود دانا!/ بارخانە سەنگین، تەن ناتەوانا «میرزا شەفیع»› ٤. شوێنی دانان و هەڵگرتنی بار ٥. وەختی تووتن فرۆشتن ٦. *[کینایە]* کەفەڵی گەورەی ژنان ‹شا ئەو بار و بارخانەیە› ٧. *[کینایە]* ئەندامی جینسی پیاو، لەگەڵ ئاماژە بە زل بوونی ☚ ١. محمولەی بازرگانی ٢. بار برهم انباشته ٣. نامەی اعمال ۴. محل بار زدن و خالی کردن ۵. موسم فروش تنباکو ۶ باسنِ بزرگِ زنان ٧. اندام جنسی بزرگ مرد

**بارخانی** / barxanî/: ☜ بارخانو

**باردار** / bardar/: ئاوەڵناو. بارەدار؛ زگپڕ؛ ئاوس؛ دووگیان ☚ باردار

**بارداری** / bardarî/: ناو. زگپڕی؛ سکپڕی؛ ئاوسی؛ ئاڤزی؛ لەمەپەڕی؛ دووگیانی ☚ بارداری

**باردۆخ** / bardox/: ☜ بارودۆخ

**بارڕاستی** / barřastî/: ناو. بارودۆخی بە دڵ بوونی کار و بار ☚ کاردرستی

**بارزە** / barze/: ناو. جەوی دار ☚ صمغ درخت

**بارسا** / barsa/: ☜ بارستایی

**بارسایی** / barsayî/: ☜ بارستایی

**بارست** / barist/: ناو. ١. ☜ بارستایی ٢. *[مەجاز]* هەند؛ چەند؛ قەرا؛ ڕادە ‹بارستی کار› ☚ ١. ☜ بارستایی ٢. اندازه

**بارستایی** / baristayî/: ناو. بارسا؛ بارست؛ بارسایی؛ قەوارە؛ قەبارە؛ شاقەل؛ هەندی ئەو بۆشاییە کە تەنێکی سێ‌لایی دایدەگرێ ‹بە بارستایی چیا بەرزەکانمان، جەندەکی لاوانی خوێن‌گەرمی کوردی سەربەرز و ئازا بوو کە بە تاوانی ئەوینی سەربەستی و لە سەر هەستی نیشتمانپەرستی، پەل-پەل کرابوون و وەسەر یەک نرابوون و لە گیشە درابوون «هەژار، *شەرەفنامە*»› ☚ حجم

**بارسڤک** / barsivik/: ☜ بارسوک

**بارسۆک** / barsok/: ☜ بارسوک

**بارسۆکی** / barsokî/: ☜ بارسوکی

**بارسوک** / barsûk/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* بارسڤک؛ بارسۆک: ١. کەمئەرک ‹کەر کوڵ و بارسووک «مەسەل»› ٢. خەمنەخۆر بۆ ماڵی دنیا ٣. هەژار و نەدار ☚ ١. کم‌دردسر ٢. سبکبار ٣. آس‌وپاس

**بارسوکی** / barsûkî/: ناو. بارسۆکی؛ ئاسوودەیی و کەمئەرکی ☚ سبکباری

**بارش** / bariş/: ناو. ١. بارشت؛ وارشت؛ بارژن؛ وەشت؛ ڕەوتی بارین لە هەورەوە ‹شەرەر و تابش و بارش لە دەمی ڕەعدی بەهار/ ئەسەری سۆزشی گریانە لە ئەفغانمدا «نالی»› ٢. پەرژین؛ وارش ☚ ١. بارش ٢. حصار؛ بارو

**بارشت** / barişt/: ناو. بارش؛ وارش ‹لە دەریاوە قەتاری هەوری بارشت کەوتە دووی پێشەنگ/ بە سەر سنگی چیادا چۆکی داداوە، کش و بێدەنگ «گۆران»› ☚ بارش

**بارفرۆش** / barfiroş/: ناو. فرۆشیاری گەورەی میوە و سەوزی؛ ئەو کەسە میوە و ئاوەڵەکانی بە کۆ دەسێنێ و دەیانفرۆشێ ☚ بارفروش

**بارفیکس** / barfîks/: ☜ باڵفیکس

**بارڤە** / barve/: ناو. بۆران؛ بادەوە ☚ بوران

**بارقورس / barqûrs/**: ئاوەڵناو. [کینایە] بارگران؛ ڕەنجبەر ☰ زحمتکش

**بارکوڵە / barkûłe/**: ناو. کۆڵەبار؛ بارێکی کەم ‹بارکوولەیەک چێلگ ها وە کوولیەوە› ☰ بارِ مختصر

**بارکەوتوو / barkewtû/**: ئاوەڵناو. [مەجاز] بارکەوتە: ١. کلۆڵ؛ بۆنەهاتوو؛ خراپ لێ قەوماو ٢. لاکەوتە؛ لاکەفتە؛ داماو ☰ ١. بدبخت ٢. درمانده

**بارکەوتە / barkewte/**: ☜ بارکەوتوو

**بارکێش / barkêş/**: ناو. باربەری بەهێز ☰ بارکش

**بارکێشی / barkêşî/**: ناو. ١. حەماڵی؛ کار و ڕەوتی بار کێشان ٢. کاری هەڵسەنگاندنی بار ☰ ١. حمالی ٢. توزین بار

**بارگا / barga/**: ☜ بارەگا

**بارگر / bargir/**: ناو. دارێ کە ئەیخەنە چینی بارەکانی بارخانەوە تا نەڕمێ ☰ چوب لای بار

**بارگران / barg(i)ran/**: ئاوەڵناو. [کینایە] ١. بارقورس ‹بارگرانم ئەز، ڕێ دوور و سەرکاش/ خووزم، پشتکولم، دمێنم ل پاش «جگەرخوێن»› ٢. خوێنتاڵ؛ چاونەزێر ٣. تەوەزەل؛ تەمەڵ؛ لەشقورس ☰ ١. زحمتکش ٢. گرانجان ٣. تنبل

**بارگرانایی / barg(i)ranayî/**: ناو. زەحمەتی؛ ئەرک و زەحمەتی زۆر ☰ رنج بسیار

**بارگرانی / bargiranî/**: ناو. ١. بارگرانایی؛ ئەرک و ماندوویی زۆر ‹وشتر نە بەسی بوو بارگرانی/ وا زەنگۆڵەشی خرا ملانی! «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ٢. داب و دەستوور؛ نەریتگەلی وەرگیراو لە لایەن دەزگا یان کۆمەڵگایەکەوە بۆ ئەنجام دانی کارێکی تایبەت ‹میوانییەک ئەم هەموو بارگرانییەی بۆچییە؟› ☰ ١. رنج طاقت‌فرسا ٢. تشریفات

**بارگلان / barg(i)lan/**: ☜ بانگلێر

**بارگوێزی / bargiwêzî/**: ☜ باربەری ـ١

**بارگە / barge/**: ناو. ١. خورجین و بەر و بوخچەی سەفەر ٢. باری خواردەمەنی و ئەسپابی سەفەری پیاوی ماقووڵ ٣. بارەگا؛ بارگا دەزگا و خانووبەرەی گەورەپیاوان ‹زاری و زگاری و زویری کەردم/ وە بارگەی پاکت پەنا ئاوەردم «مەولەوی»› ☰ ١. رخت سفر ٢. بار و بنه سفر بزرگان ٣. بارگاه

▣ **بارگە تێکنان**: خۆ ئامادە کردن بۆ سەفەر ‹کە بارگەت بۆ هەوار تێکنا عەزیزم/ شکا ئەستوندەکی تاولی مرادم «هێمن»› ☰ رخت سفر بربستن

**بارگە تێکەوە پێچان**: خروپری سەفەر کۆ کردنەوە ‹بارگەیان تێکەوە پێچاوە، بەڕێ بوون یاران/ لە دنێ وا بە تەنێ پاشی ئەوان من چ بکەم؟ «هێمن»› ☰ باروبندیل سفر را بستن

**بارگەچی / bargeçî/**: ناو. ١. ئابدارباشی سەفەری ماقووڵان ٢. سەرقافڵەی کاروان ٣. کارەکەرێ کە لەگەڵ بووک دەچێ بۆ ماڵی زاوا و بۆ ماوەیەک لە لای دەمێنێتەوە ☰ ١. آبدارباشی کاروان ٢. قافله‌سالار ٣. خدمتکاری کە با عروس می‌رود و مدتی با او می‌ماند

**بارگەوبنە / barge w b(i)ne/**: ناو. کەلوپەل و ئەسپابی سەفەر ‹شەنگەبیری یار و دەسبازی کچی کۆچەر نەبێ/ چۆن دەگاتە جێ هەوار و هۆبە ئەو بارگەوبنە؟ «هێمن»› ☰ باروبنه

**بارگیر / bargîr/**: ناو. بارگیل؛ بارگین؛ یابوو؛ پالانی؛ گۆلەبارگین؛ قولە؛ کورتە؛ ئەسپی نانەجیبی بار کێشان ‹کا ئەدا بە سەگ، ئێسقان بە بارگیر/ پیرەژن بۆ کوڕ، کچ ئەدا بە پیر «قانع»› ☰ یابو

**بارگیل / bargîl/**: ☜ بارگیر

**بارگین / bargîn/**: ☜ بارگیر

**بارلاری / barlarî/**: ناو. بارچەوتی؛ دۆخی لار بوونی بار ☰ بار کجی

**بارماخ / barmax/**: ☜ بەرماخ

**بارمتە / barimte/**: ناو. گرۆ؛ گرێو؛ شتێک کە لە

باتی شتێکی‌تر بە ئەمانەت داندرابێ ☰ گروگان

**بارنامە / barname**/: ناو. ١. بەرگەی نیشاندەری جۆر، کێش و ژمارەی بەستەی بار و ناو نیشانی بنێر و وەرگر ٢. لاپەڕەی لە چاپ دراو کە حکوومەت بەو مەبەستە دەیدا بە بنکەگەلی ڕاگوێزان ☰ ١و٢. بارنامە

**بارندۆخ / barindox**/: ئاوەڵناو. بارێن؛ بە باران؛ بە بارشت ☰ بارانزا

**بارنەبەر / barneber**/: ئاوەڵناو. [کینایە] بارنەوەر؛ گوێ‌نەبیس؛ لاسار و نەگونجاو ☰ نافرمان

**بارنەوەر / barnewer**/: ☜ **بارنەبەر**

**بارنەوەری / barnewerî**/: ناو. [کینایە] لاساری؛ کاری بار نەبردن و کۆڵ نەدان ☰ نافرمانی

**باروبارخانە / bar û barxane**/: ناو. ١. کەلوپەلی پارچە و شتی‌تر کە بە کاروان دێت ٢. [مەجاز] کەفەلی گەورەی ژنان ☰ ١. کالای تجارتی ٢. باسن بزرگِ زنان

**باروبنە / bar û bine**/: ناو. بارگەوبنە؛ پێداویستی سەفەر ‹تا تۆش و گولیش نەبوونە تۆزی بەر با/ مەی بێنە لە گولزاری بخەین باروبنە «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ☰ باروبنە

**باروبو / bar û bû**/: ☜ **باربو**

**باروبەندیل / bar û bendîl**/: ناو. کەلوپەلی پێچراوە و ئامادە ☰ باروبندیل

**بارودۆخ / bar û dox**/: ناو. بارێدۆخ؛ باردۆخ؛ چلۆنایەتی؛ چۆنیەتی ☰ وضعیت

**باروزگا / baruzga**/: ناو. بارەنداز؛ بارئەنداز؛ بارەناز؛ جێگەی خستنی بار ☰ بارانداز

**باروشک / baruşk**/: ناو. بارووشک؛ شلێوە؛ بارانی بە باوە ☰ باد و باران توأم

**بارویت / barwît**/: ناو. بوختان؛ هەڵبەست ‹هەموو قسەکانت بارویتە› ☰ تهمت

**بارۆشە / baroşe**/: ناو. بارووشە؛ باڕۆشە؛ باوەشێن ☰ بادبزن

▣ **بارۆشەی کارەبایی**: ناو. پەنکە ☰ پنکە

**بارۆشەکریاگ / baroşekiryag**/: ناو. باوەشێن؛ باوەشێن‌کراو ☰ باد زدە

**بارۆشەکەر / baroşeker**/: ئاوەڵناو. با ڕاوەشێن ☰ بادزن

**بارۆشەیی / baroşeyî**/: ئاوەڵناو. باوەشێنی؛ لە بیچمی بارۆشە ☰ بادبزنی

**بارۆڤ / barov**/: ناو. باڕووڤ؛ گژەبا ☰ تندباد

**بارۆکە / baroke**/: ناو. ڤارک؛ مامرک؛ ڤار؛ واڕۆک ☰ جوجەی بهارە

**بارۆنە / barone**/: ☜ **بارونە**

**بارو / barû**/: ناو. ١. شووار؛ بورج و بارووی؛ دیواری بەرز ٢. بارووت ٣. ☜ **باربو** ☰ ١. برج و بارو ٢. باروت ٣. ☜ **باربو**

**بارووت / barût**/: ناو. باڕووت؛ دەرموو؛ شۆرە؛ دەرمان تفەنگ ☰ باروت

**بارووتە / barûte**/: ئاوەڵناو. تەمەڵ؛ خوێری؛ لەش‌گران ☰ تنبل

**بارووتی / barûtî**/: ئاوەڵناو. ١. زۆر ورد ٢. ڕەشی بارووتی؛ بە ڕەنگی بارووت ☰ ١. بسیار ریز ٢. سیاه باروتی

**بارووشک / barûşik**/: ☜ **باروشک**

**باروولە / barûle**/: ناو. باسک؛ باڵ ☰ بازو

**بارونە / barûne**/: ناو. بارۆنە؛ باڵەنگ؛ شەوشین؛ ترنجۆک؛ باتوو: ١. دارێکە لە بنەماڵەی پرتەقاڵ و نارنج ٢. میوەی ڕەنگ زەرد و بۆنخۆشە کە گوڵەکانی سپییە و پتر بۆ مرەبا بەکار دێ ☰ ١. بالنگ ٢. میوەی بالنگ

**بارونەک / barûnek**/: ناو. گۆلکی یەکساڵان؛ گوێرەکەی یەکساڵە ☰ گوسالەی یکسالە

**بارە[1] / bare**/: ناو. ١. بەهرە و داهات ‹بارەی ئەو مولکەت چەندە؟› ٢. جار؛ کەڕەت؛ هەل؛ چەل ٣.

بەش؛ بێش؛ پار ‹لەو بەش ـ بەشێنە بارەی من چەندە؟› ٤. هێز؛ توانایی‹ئەم کارە گرانە، لە بارەی مندا نییە› ٥. بابەت؛ سەرباس ‹لەم بارەوە قسەی زۆر کراوە› ٦. لا؛ لایەن؛ سۆ ‹کارەکە کەوتۆتە بارەیکی تردا› 🇮🇷 ۱. حاصل؛ بهره ۲. دفعه؛ نوبت ۳. سهم ۴. توانایی ۵. موضوع ۶. جهت

**بارە**[2]: پێشوشە. پێش ناو دێ و پێوەندی بە بار و گواستنەوەوە هەیە ‹بارەخوێ؛ بارەدار؛ بارەگەنم؛ بارەگوێز› 🇮🇷 بار

**ـ بارە**[3]: پاشەوشە. ـ وارە؛ ـ پاتە؛ ـ جارە ‹دووبارە› 🇮🇷 ـ بارە

**بارەبار / barebar/**: ناو. کۆچوبار؛ کۆچومال 🇮🇷 اسباب و اثاثیەی کوچ کردن

**بارەبوو / barebû/**: ☜ **باربوو**

**بارەبەر / bareber/**: ناو. بارەکی؛ هەرچی باری بکەن و باری پێڕاگوێزن ‹بە نانەسکی کارەکەرمان بێ/ بە شەو و بە ڕۆژ بارەبەرمان بێ «قانع»› 🇮🇷 باربر

**بارەبی / barebî/**: ☜ **باربوو**

▣ **بارەبی کردن**: باربوو کۆ کردنەوە؛ کۆ کردنەوەی پارە بۆ یارمەتی کەسێک 🇮🇷 گلریزان برای کسی

**بارەپێمەڕە / barepêmeře/**: ناو. ئەوەندە گڵ یا قوڕەی کە بە جارێکی پێمەڕە هەڵدەگیرێ ‹بارەپێمەڕەیەکم لەو خیزە دەنێ بۆ گوڵدانەکەم› 🇮🇷 اندازەای بار یک بیل از گِل یا خاک

**بارەچە / bareçe/**: ناو. داهات؛ دەرامەت 🇮🇷 درآمد

**بارەخوێ / barexwê/**: ناو. ۱. باری خوێ ۲. جەواڵی پڕ لە خوێ ۳. بارباراێنێ؛ گەمەیێکە 🇮🇷 ۱. بار نمک ۲. جوال پر از نمک ۳. نوعی بازی

**بارەخوێیانێ / barex(i)wêyanê/**: ☜ **بارباراێنێ**

**بارەدار / baredar/**: ئاوەڵناو. ۱. ☜ **باردار** ۲. بەردار 🇮🇷 ۱. ☜ **باردار** ۲. سودمند

**بارەقەڵا / bareqeła/**: ☜ **بارەکەڵا**

**بارەکەلا / barekela/**: ناو. بارەکەڵا؛ لە جیاتی هەڵمات، قەرەبووی مەڕمەڕی کایە 🇮🇷 تعویض تیله

**بارەکەللا / barkella/**: ☜ **بارەکەلا**

**بارەکەڵا / barekeła/**: دەنگ. بارەقەڵا؛ ئافەرەم؛ دەستخۆش ‹حەمەی وەستا فەتاح سەد بارەکەڵا لەم سەروڕیشە/ کە گوێدرێژێ بە تەنها چۆن ئەبا ئەم بارە قامیشە؟! «شێخ ڕەزا»› 🇮🇷 آفرین

**بارەکی**[1] **/ barekî/**: ناو. بارەبەر 🇮🇷 باربر

**بارەکی**[2]: ئاوەڵناو. شیاوی بار لە سەر دانان (چوارپێ) ‹ئێسترە زەرد ساڵێکە بارەکییە› 🇮🇷 بارکش

**بارەگا / barega/**: ناو. بارگا: ۱. دەزگا و خانووبەرەی گەورەپیاوان ‹بێ تۆ بەو خوشووع دەس وە دوعاوە/ کێ گەردەنکەج بۆ نەو بارەگاوە «مەولەوی»› ۲. شوێنی دامەزراوەیەکی فەرمی، حیزبی و ... 🇮🇷 ۱. بارگاه ۲. دفتر سیاسی، حزبی و ...

**بارەگەه / baregeh/**: ناو. بارەگا؛ بارگا ‹ئەڤ کارەگەها عەزیم و دەووار/ ئەڤ بارەگەها بەدیع و سەبیار «ئەحمەدی خانی»› 🇮🇷 بارگاه

**بارەمەند / baremend/**: ☜ **بەهرەمەند**

**بارەناز / barenaz/**: ☜ **باروزگا**

**بارەنداز / barendaz/**: ناو. بارەنناز: ۱. باروزگا؛ جێگەی بار کردن و داگرتنی بار ۲. دەلاقەی کادێن کە کا و گزرەی لێوە تێدەکەن 🇮🇷 ۱. بارانداز ۲. دریچەی کاهدان کە از آن کاه و علف در کاهدان می‌ریزیند

**بارەنگێو / barengêw/**: ☜ **بارهنگێڤ**

**بارەنناز / barennaz/**: ☜ **بارەنداز**

**بارەوەر / barewer/**: ئاوەڵناو. ۱. بەردار ‹زوڵف ئەگەر دووکەڵە، دووکەڵ بەری گوڵناری نییە/ سەرو ئەگەر قامەتی، کەی سەروی ڕەوان بارەوەرە؟! «نالی»› ۲. باردار 🇮🇷 ۱. ثمردار ۲. باردار

**بارهاتوو / barhatû/**: ئاوەڵناو. پەروەردە؛ دەسپەروەردە 🇮🇷 پرورده

**بارهنگێڤ** / barhingêv/: ناو. بارەنگێو: ١. بەرد یان داری پەنا ڕێگە کە باری تێ دەگیرێ ٢. [مەجاز] کەسێ کە بە گاڵتە پێ کردن خەڵک تووڕە دەکا ☰ ١. سنگ یا درخت کنار راه که بار با آن برخورد می کند ٢. مسخره کننده

**بارهۆ** / barho/: ☜ بەهرك

**بارهەڵگر** / barhełgir/: ناوەڵناو. ١. بارەبەر ٢. [کینایە] ڕەنجدەر و زەحمەتکێش ☰ ١. باربر ٢. زحمتکش

**بارهەنگ** / barheng/: ناو. ڕکێشە؛ دانەی ورد و سوور و ئاوداری ڕکێشە کە بۆ دەرمان بە کار دێ ☰ بارهنگ

**بارهێنەر** / barhêner/: ئاوەڵناو. بەرگر؛ بەردار ☰ بارور

**باری**[1] / barî/: ناو. لۆسە؛ باریە؛ پاریە؛ مەڵغە؛ لەوازە؛ لێهاز؛ برازە؛ ئاسنێکی درێژی دەمتیژە وە بن بەرد و شتی قورسی دەدەن تا هەڵیبێنن ☰ اهرم

**باری**[2]: ئاوەڵناو. لەبار بۆ بار کردن ‹ماشێنی باری› ☰ باری

⊡ **باری بوون**: ئامادە بوون بۆ بار بردن ☰ باری بودن

**باری کردن**: ڕاهێنان بۆ بار بردن ☰ باری کردن

**باریدۆخ** / barîdox/: ☜ بارودۆخ

**باریسە** / barîse/: ناو. ١. فڕفرە؛ فرفرۆکە ٢. داری نێوان کۆلەکە و کاریتە ☰ ١. فرفرەی کاغذی ٢. چوب میان ستون و دیرک

**باریک** / barîk/: ئاوەڵناو. ١. زراڤ؛ تەنگ؛ تەنگەبەرە؛ بە پانایی کەمەوە ‹شەوێکی تاریک، ڕەهێکی باریک/ هەر بە ئومێدی چرای جەماڵم «وەفایی»› ٢. لەڕ و لاواز ‹... بە خەیاڵ بێنە بەر چاوی خۆت: درێژێکی باریکی ناقۆڵای شان داتەپیو، ملێکی سیسی چلکن ... «هەژار، چێشتی مجێور»› ٣. [مەجاز] ناسک؛ مەلاهیم ‹هەموو هەستێکی باریک و پڕ لە مانای ناسک، با مەوزوونیش نەبێ، دەتوانێ ناوی شیعری لێ بنرێ «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ ١. باریک ٢. لاغر ٣. لطیف

⊡ **باریک ڕستن**: [کینایە] پاشەکشە کردن؛ دانەواندن؛ یێخ بوون/ خواردن ☰ کوتاه آمدن

**باریکەو بوون**: [مەجاز] دزە کردن؛ پێدزە کردن؛ فیزماڵک دان؛ خۆ دزینەوە ☰ جیم شدن

**باریکان** / barîkan/: ناو. ١. ڕێسی زۆر باریک و ناسک ٢. لووتە کێو لە بنارەوە بەرەو دەشت؛ لای باریکایی ٣. بەشێک لە زەوی و کێڵگە کە لە چاو پانتای زەوییەکە زۆر باریکترە و درێژ بۆتەوە نێو بەیار یان زەویەکەی لاشانیەوە ☰ ١. نخ نازک ٢. دماغەی کوه ٣. زمین زراعی کم‌عرض

**باریکاو** / barîkaw/: ناو. ئاودێری بە ئاژین کردنی ئاوی کەم لە هەر کەلەوەژەوە ‹پیاز ئەشێ باریکاو بدیرێت› ☰ آبیاری با آب اندک

**باریکایی** / barîkayî/: ناو. باری باریکی ☰ باریکی

**باریکبین** / barîkbîn/: ئاوەڵناو. [مەجاز] وردبین؛ زۆر سەرنجدەر ☰ باریک‌بین

**باریکڕێسی** / barîkřêsî/: ناو. [کینایە] مەرایی؛ کاری دانەواندن و قسەی لووس کردن ☰ تملّق

**باریکوبنێسی** / barîk û b(i)nêsî/: ناو. لەڕی و کزی زۆر لە نەخۆشییەوە ☰ لاغری بیش از حد

**باریکە** / barîke/: ناو. ١. زولاک؛ شەلیت؛ تەسکە؛ ڕیواڵە؛ تیزماڵک؛ بەشێکی باریک و درێژ لە شتێک ٢. گاڵەخۆرە؛ هەرزنە؛ هەرزنەکێ؛ مەلێکە لە تۆرەمەی بەرگاویلە بە پشتی بۆر و بەر زکی کاڵ، باڵی خەت ڕەش، بڕۆی مەیلەو سپی، سەری وردەخاڵی بۆر کە لە ناو پنچکی بەیار و خیزەڵان دەژی و زستانان دێتە زەوی و زاران، هاوینان زۆر دەکا ٣. ڕیزەتەقەڵی پەراوێزی جلک لە دەرەوە ☰ ١. باریکە؛ نوار ٢. پیت خاکی ٣. دوخت

حاشیەی لباس

▣ **باریکەی ناوێ**: مەلێکە لە تۆرەمەی بەرگاویلـە، قاچی لەوانی‌تر بۆرترە، زستانان لە گۆل و ئاوگر و قـەراخ دەریـا دەبینـرێ، لـە شـاخان لـە قەلشـتەبەرداندا هێلانـە دەکـا و زسـتانان زۆر دەکا ⇆ پیت تالابی

**باریکەی پانیەدرێژ**: پانیـەدرێژە؛ مەلێکـە لـە تۆرەمەی بەرگاویلە، ١٧,٥ سانتیمیترە، کلک و لاقی لە باریکـەلانی‌تـر درێژتـرە، لـە مێـرگ و چیمەن و مەرەزەجاڕان دەبینرێ ⇆ پیت پادراز

**باریکەی داری**: مەلێکە لە تۆرەمەی بەرگاویلە، لە باریکـەکانی‌تـر نـەختێ قەلـەوتر و دەنـدووک خڕترە، تەنیا باریکەیەکە لە سەر دار دەژی و لە ناو گوڵ و گیا هێلانە دەکا ⇆ پیت درختی

▣ **باریکـە(پێ)دان**: *[مـەجاز]* باریکـــەوبوون؛ خـــۆ دزینەوە؛ فیزماڵـک دان ‹باریکـەی دایـە و بـۆی دەرچووا› ⇆ جیم شدن

**باریکەڕا** / barîkeřa/: ☜ **باریکەڕێ**

**باریکـەڕێ** / barîkeřê/: نـاو. باریکـــەڕا؛ ڕچـــە؛ کوێرەڕێ؛ کۆرەڕا؛ کوورەڕێ؛ توولـەڕێ؛ بزنـەڕێ؛ ولاخـەڕێ؛ ڕێچکـە؛ شڤـاڕێ؛ شڤـەرێ؛ شڤـیلە؛ ئاهەڕا؛ ڕەپێلگە؛ ڕێگەی تەسک و بە پێچ و پلـۆچ کە بە هـۆی هـاتوچـۆی خەڵـک و چوارپێیـان بەدیهاتووە ⇆ کورەراه

**باریکەلانە** / barîkelane/: ☜ **باریکەلە**

**باریکەلـە** / barîkele/: ناوەلـــناو. باریکەلانـــە؛ باریکەلانە؛ باریکەڵە؛ بـە جەسـتەی باریکـەوە ⇆ باریک‌اندام

**باریکەڵانە** / barîkełane/: ☜ **باریکەلە**

**باریکەڵە** / barîkełe/: ☜ **باریکەلە**

**باریکی** / barîkî/: ناو. زراڤی ⇆ باریکی

**بـارین** / barîn/: چـاوگ. تێنەپەڕ. //باریـت؛ دەبـارێ؛ ببارە// باران؛ هاتنە خواری بەفر و باران ‹ڕۆژ نەبوو چەند ڕەهێڵەی تونـد نـەهێنێ و شـەو نـەبوو چەنـد ڕێژنەی بەخوڕەم نەبارێ «هێمن»› ⇆ باریدن ·

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: باریو/ چاوگی نەرێنی: نەبارین

**بارینە** / barîne/: ناو. وەنەوز؛ چورت؛ خەونووچکە ⇆ چُرت

**باریە** / barye/: ناو. ١. ☜ **باری**[1] ٢. بۆریا؛ بارییە؛ حەسیر؛ ڕایەخی لە جەگەن ⇆ ١. ☜ **بـاری**[1] ٢. بوریا

**بارییە** / barîye/: ☜ **باریە ـ٢**

**بارێ** / barê/: ئاوەڵکار. نەیسـە؛ باڵـێ؛ هـەرچۆنێ بێت ⇆ باری؛ به هرجهت

**بارێزە** / barêze/: ناو. شەوەر؛ شەبدەر ⇆ شبدر

**بارێسـەدوخ** / barêsedux/: نـاو. سەلکەتەشـــی؛ سەرەتەشی ⇆ سردوک

**بارێشک** / barêşk/: ☜ **باوێشك**

**بـارێن**[1] / barên/: ئاوڵـناو. خـاوەن تایبەتمەنـدی باراندن ⇆ بارانزا

• **بارێن**[2]: پاشەوشە. تایبەتمەنـدی ئـەوی دەبارێنـێ ‹خۆڵبارێن› ⇆ بارنده

**باڕ** / bař/: ناو. باڕۆکە؛ باڕۆک؛ باڕک؛ باڕە؛ باڕەکە؛ واڕۆک؛ واڕۆک؛ جووجەڵەی نابالـغ ‹وەک دەڵـێن ئێوە بە چل ساڵ باڕن/ تووشی تووش نایەن و کۆسپ و باڕن «هەژار، *بۆکوردستان*»› ⇆ جوجەی نابالغ

**باڕانـدن** / bařandin/: چـاوگ. تێـپەڕ. //باڕانـدت؛ دەباڕێنی؛ بباڕێنە// هاوار و گازی کردنی بزن و مەڕ ⇆ صدا درآوردن بز و گوسفند

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەباڕاندن

**باڕژن** / bařijin/: ناو. بارش؛ وارشت؛ ڕەوتی بـارین ‹باڕژنـی بەرد ئەکا بە ئاو «شێرکۆ»› ⇆ بارش

**باڕک** / bařik/: ☜ **باڕ**

**باڕن** / bařin/: ناو. بـاکوت: ١. بـەفرێ کـە بـا لـە بڵـندایی هێنـابێتی و دە قووڵـکەی پەسـتاوتبێ ‹وەک دەڵێن ئێوە بە چل ساڵ باڕن/ تووشی تـووش

نایەن و کۆسپ و بارِن «هەژار، *بۆ کوردستان*» ٢. باوەرێن؛ بارِێزە؛ ئەو میوەی کە با وەراندبێتی 📚 ١. برفی کە باد آن را جمع کردە باشد ٢. میوەی باد ریختە

**بارِنایۆ / bařnayo**: چاوگ. هێنانە بارِەبارِ 📚 بە صدا درآوردن بز و گوسفند

**بارِنج / bařinc**: ئاوەڵناو. ڕەنجبەبا 📚 رنجبرباد

**بارِۆژ / bařoj**: ناو. بای ڕۆژانە ‹بارِۆژ هەڵناکا شەن بکەین› 📚 باد روزانە

**بارِۆشە / bařoşe**: ☜ **بارِۆشە**

**بارِۆک / bařok**: ☜ **بارِ**

**بارِۆکە / bařoke**: ☜ **بارِ**

**بارِۆگ / bařog**: ئاوەڵناو. باگر؛ باپێچ؛ تایبەتمەندی شوێنێ کە با بیگرێتەوە 📚 بادگیر

**بارِووت / bařût**: ☜ **بارِووت**

**بارِووتخانە / bařûtxane**: ناو. جبەخانە؛ جەبەڵخانە؛ جێگەی چەک و فیشەک پڕکردنەوە 📚 زرادخانە

**بارِووشە / bařûşe**: ☜ **بارِۆشە**

**بارِووڤ / bařûv**: ☜ **بارِۆڤ**

**بارِە / baře**: دەنگەناو. هاواری ئاژەڵی وردە ‹بارِە و کارِەی ماک و زایە/ سەمای هێنایە سەمایە «هەژار، *بۆ کوردستان*»› 📚 بع ـ بع

⊡ **بارِە برِین**: *[کنایە]* بێدەنگ کردن؛ دەمکوت کردن 📚 منکوب کردن

**بارِەبارِ / bařebař**: دەنگەناو. باڵەبال 📚 صدای احشام

**بارِەبارِە / bařebaře**: ناو. هەرا و هوریای ئاژەڵی وردە 📚 صدای بز و گوسفند

**بارِەش / bařeş**: ناو. ڕەشەبا؛ بای هەرە بە قەوەت ‹هەناسەم هێندە مەغروورە لە بارِەش مەرحەبا ناکا/ بە غەیرەز دڵ کە مەسکەنیە خەیاڵی ماسیوا ناکا «قانع»› 📚 باد قطبی

**بارِەکە / bařeke**: ☜ **بارِ**

**بارِەکەو / bařekew**: ناو. کەوبارِ؛ جووجکە کەو 📚 جوجە کبک

**بارِیای / bařyay**: چاوگ. بارِەبارِ کردن 📚 بع ـبع کردن

**بارِیرە / bařîre**: ☜ **باوەشێتە**

**بارِیزە / bařîze**: ناو. گیانوزینە؛ گیایەکی ئالفی گەڵا کەسکە؛ بە پرزە و گوڵی زەردی زۆرەوە بۆ دەرمان دەشێ 📚 بارزد

**بارِین / bařîn**: چاوگ. بارِەبارِ کردن؛ بارِاندنی ئاژەڵ 📚 بع ـبع کردن

**بارِێز / bařêz**: ☜ **باوەرێن**

**بارِێزان / bařêzan**: ناو. گەڵارِێزان؛ پاییزی درەنگ 📚 برگریزان

**بارِێزە / bařêze**: ناو. ١. بەرِەزا؛ خەزەرۆک؛ گیایەکە لە بنەماڵەی شویت و رازیانە، تایبەتی کوێستان و بەردی شاخانە، گەڵاکانی لە گێزەر دەچێ بەڵام لاسکەکەی هەندێ سەوزی ئاماڵڕەشە ‹... ئەمدەن بە دەم بارِێزەکەی ئەوینەوە و/ لە شەختەبەندانی گیانا ئەمرِسکێنن «شێرکۆ»› ٢. وردەبارانی بە دەم باوە ٣. بارِن؛ باوەرێن؛ ئەو میوەی با وەراندبێتی 📚 ١. رازیانەی کوهی ٢. باد همراە با ریزەهای باران ٣. میوەی باد ریختە

**باز[١] / baz**: ناو. ١. بازی قزڵ؛ تەرلان؛ شاباز؛ تەللان؛ بازی؛ مەلێکی ڕاوچی ٤٨ تا ٦٠ سانتیمەترە، بە باڵی پان و دەنووکی تیژەوە، لە لێرەواران، دارستانان و کوێستانان دەژی، مێی لە نێری زۆر گەورەترە ‹قاسپەی کەو لە کێو، تەقڵەی باز لە دەشت/ تا کوردستان بێ لە کوێیە بەهەشت؟! «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ٢. بازد؛ باز ـ باز؛ قەڤز؛ قەڵباز؛ قەفاز؛ قەڵبەز؛ قەڵمباز؛ حەمباز؛ قومچ؛ قومل؛ هەڵقوم؛ خنج؛ گنج؛ قنج؛ چرتک؛ شەقام؛ کاری هەڵبەزین و لە شوێنێکەوە خۆ هەڵدانە

شوێنێکی تر ٣. ڕێگەی ناسراو ‹بازی بیریان› ٤. فیزمالک؛ کاری خۆدزینەوە ٥. باج و پیتاک ٦. *[کیمیا]* بەرانبەری ترش (ئەسید) ☰ ١. باز شکاری؛ طرلان ٢. پرش ٣. گُدار؛ گُذرگاه ۴. جیم‌فَنگ ۵. باج ۶. باز (مقابل اسید)

▣ **بازی بیریان:** ئەو ڕێگایە هەموو ڕۆژێ بیری بۆ مەڕ دۆشین پێدا دەڕوا ☰ مسیری که شیردوش هر روز می‌رود

**بازی قزڵ:** باز؛ تەڕلان ☰ طرلان؛ باز شکاری

⊡ **باز بردن:** پەڕین؛ پەڕش کردن ‹لە جۆگەلەوە بازم برد، کەوتم› ☰ پریدن

**باز بەستن:** پەڕین؛ پەڕش کردن ‹چ هەستی کردووە، هەستا؟/ چ بازی بەست و وەستاوە؟ «حاجی قادر»› ☰ پریدن

**باز دان:** ١. پەڕین بە هەنگاو ٢. غاردان؛ بە پەلە ڕۆیشتن ٣. لە ترسان هەڵاتن ☰ ١. پریدن ٢. دویدن ٣. فرار کردن

**باز(ی دەوڵەت) لە سەر نیشتن:** *[کینایە]* بەخت یار بوون؛ باش بۆ هاتن ☰ بخت یار بودن

**باز**[٢]: ئاوەڵناو. ١. ئاواڵە؛ واڵا ‹درگاکەتان باز بوو، هاتمە سەر› ٢. بازگ؛ نێو چاوان سپی ‹ئەسپی باز› ☰ ١. باز ٢. پیشانی سفید

**باز**[٣]: ئاوەڵکار. دیسان؛ دووبارە ‹باز هاتەو› ☰ دوباره

**ـ باز**[٤]: پاشەوشە. ـــ باز؛ ـ واز: ١. ئەوگر؛ خوازیار ‹کۆترباز› ٢. ئەنجامدەری کارێک ‹چەترباز› ٣. بوونی هەڵسوکەوتێک ‹فێڵباز؛ ئەلحەزەر لەم چەرخی کەچبازە، بە ڕووچەرخاندنێک/ چەندە سوڵتان و شەهی کرد و دەکا بێ‌دەست و مات! «مەحوی»› ٤. ئامادە بۆ بەخت‌کردنی شتێک ‹سەرباز› ٥. ـ تێپەڕین ‹ڕێباز› ☰ (١تا۴). ـ باز ۵. ـ گُذر

**بازار / bazar:** ☜ **بازاڕ**

**بازارتیژی / bazartîjî:** ☜ **بازاڕگەرمی**

**بازارتێژی / bazartêjî:** ☜ **بازاڕگەرمی**

**بازاڕ / bazař:** ناو. بازار؛ وازاڕ: ١. سووک؛ شوێنی سەودا و مامەڵە ‹بازاڕی دەهرە، قیمەتی ئەشیا بە جێگەیە/ مێشێ لە ڕووی نیگاری بنیشێ لە خاڵ ئەچێ! «حەمدی»› ٢. *[مەجاز]* سەودا؛ مامەڵە ‹ئەوساڵ بازاڕی گەنم باشە› ☰ ١. بازار ٢. معامله

▣ **بازاڕی ئازاد:** بازاڕێک کە نرخەکانی بە پێی ڕانان و داخواز دادەنرێ ☰ بازار آزاد

**بازاڕی بورس:** شوێنی سەودای زێڕ و زیو و نەوت و... ☰ بازار بورس

**بازاڕی سیا:** ڕەشە بازار؛ بازاڕی ڕەش؛ شوێنی سەودای کاڵا، دوور لە چاوی قانوون ☰ بازار سیاه

**بازاڕی شام/** *[کینایە]* گاڵە بازار؛ جێگای شلۆق و بێ‌سەرە و بەرە ☰ بازار شام

**بازاڕی گشتی:** بازاڕێ کە کووتاڵی جۆراوجۆری بۆ هەموو کڕیاران تێدایە ☰ بازار عمومی

**بازاڕی ناوخۆ:** بازاڕی ناوەخۆ؛ بازاڕی ڕانان و داخواز لە ناو وڵاتدا ☰ بازار داخلی

⊡ **بازاڕ خەوتن:** نەمان یان کەم بوونەوەی دان‌وستانی بازاڕ ☰ کساد شدن بازار

**بازاڕ دیتنەوە:** دۆزینەوەی کڕیار بۆ کاڵایەک ☰ بازار پیدا کردن

**بازاڕ شکاندن:** لە برەو خستنی بازاڕی شتێک ☰ بازار شکستن

**بازاڕ کڕن:** ١. نرخ پرسین ‹م گەنم بازاڕ کر، گەلێ بوهایە› ٢. کڕین؛ سەندن ☰ ١. نرخ پرسیدن ٢. خرید کردن

**بازاڕ هەبوون:** دان‌وستان هەبوون ‹کاڵای چاک هەمیشە بازاڕی هەیە› ☰ بازار داشتن

**بردنە بازاڕ:** بردن بۆ بازاڕ بە مەبەستی فرۆشتن ☰ به بازار بردن

**چوونە بازاڕ:** چوون بۆ بازاڕ بە مەبەستی کڕین

🇮🇷 بە بازار رفتن

**بازاڕتیژی** / bazařtîjî/: ☜ **بازاڕگەرمی**

**بازاڕتێژی** / bazařtêjî/: ☜ **بازاڕگەرمی**

**بازاڕچە** / bazařçe/: ناو. ١. تاریکەبازاڕ ٢. سووکەبازاڕ 🇮🇷 ١و٢. بازارچە

**بازاڕخۆش** / bazařxoş/: ئاوەڵناو. زۆرفرۆش؛ سەوداخۆش 🇮🇷 خوش‌معامله

**بازاڕخۆشی** / bazařxoşî/: ناو. هەرەتی گەرم بوونی سەودا و مامەڵە ‹لە بازاڕخۆشیدا فرۆشتم› 🇮🇷 گرمی بازار

**بازاڕشلی** / bazařş(i)lî/: ناو. بازاڕکەسادی؛ کەمی سەودا و مامەڵە 🇮🇷 کسادی

**بازاڕکەر** / bazařker/: ناو. کەسێ کە زۆر هاتوچۆی بازار دەکا و شت بۆ خەڵک ئەکڕێ 🇮🇷 اهل بازار

**بازاڕکەساد** / bazařkesad/: ئاوەڵناو. بازاڕ کەساس؛ بێبازاڕ 🇮🇷 بازارکساد

**بازاڕکەسادی** / bazařkesadî/: ناو. بازاڕکەساسی؛ بێبازاڕی؛ بازاڕی کەمکڕین و فرۆشتن 🇮🇷 کسادی

**بازاڕکەساس** / bazařkesas/: ☜ **بازاڕکەساد**

**بازاڕکەساسی** / bazařkesasî/: ☜ **بازاڕکەسادی**

**بازاڕگەرمی** / bazařgermî/: ناو. بازاڕتیژی؛ بازاڕتێژی؛ گەرمبازاڕی؛ کاری بە شتێکدا هەڵگوتن بۆ فرۆشتنی 🇮🇷 بازارگرمی

**بازاڕوان** / bazařwan/: ☜ **بازرگان**

**بازاڕوانی** / bazařwanî/: ☜ **بازرگانی**

**بازاڕی**[1] / bazařî/: ناو. وازاڕی؛ دوکاندار؛ مامەڵەچی ناو بازار 🇮🇷 بازاری

**بازاڕی**[2]: ئاوەڵناو. وازاڕی: ١. تایبەت بە بازاڕ ٢. *[مەجاز]* کەمنرخ و سووک ‹گوڵ ئەمڕۆ خوی موقابیل کرد بە ڕوخسارت لە لای خەڵقی/ بەڵێ هەردەم دراو و هەرزەگۆن مەحبووبی بازاڕی «حەریق»› 🇮🇷 ١. ویژەی بازار ٢. مُبتذل

**بازاڕییانە**[1] / bazařîyane/: ئاوەڵناو. ١. تایبەت بە ناو بازاڕ ‹قسەی بازاڕییانە› ٢. دوور لە نرخی ڕاستەقینە و تێکەڵ بە فەن و فێڵی بازاڕ ‹نرخی بازاڕییانە› 🇮🇷 ١و٢. بازاری

**بازاڕییانە**[2]: ئاوەڵکار. ١. وەک ناو بازاڕ ‹بازاڕییانە قسەی دەکرد› ٢. بە شێوەی کەسانی هەلپەرست ‹لەگەڵ هەر ڕووداوێکدا، بازاڕییانە دەجووڵاوە› 🇮🇷 ١و٢. بازاری

**باز.باز** / baz baz/: ناو. ١. هەڵبەزدابەز و بەخۆ هەڵدان و هاتوچۆ کردن ‹ئەو ڕۆژی دەچییە بن گڵ، هەزار گرێ لەسەر دڵ/ مشکان لە مێشکی وشکت باز- باز و گەز-گەزێنە «هەژار، *شەرەفنامە*»› ٢. ☜ **باز**[1]**-١** 🇮🇷 ١. جست‌وخیز ٢. ☜ **باز**[1]**-١**

**بازبازان** / bazbazan/: ناو. بازبازۆکێ؛ بازبازێن؛ بازبازدێن؛ بازبازووکێن؛ بازدەڵباز؛ بازدەڵبازد: ١. کێبەرکێ لە بازداندا ٢. باز- باز؛ بزۆزی و هەڵبەزدابەز 🇮🇷 ١. مسابقەی پرش ٢. جست‌وخیز

**بازبازدێن** / bazbazdên/: ☜ **بازبازان**

**بازبازۆکێ** / bazbazokê/: ☜ **بازبازان**

**بازبازووکێن** / bazbazûkên/: ☜ **بازبازان**

**بازبازێن** / bazbazên/: ☜ **بازبازان**

**بازبردوو** / bazbirdû/: ☜ **بازوە**[2]

**بازبەر** / bazber/: ناو. ١. جێی دەرباز بوون ٢. بازدەر؛ کەسێ کە باز دەبا 🇮🇷 ١. مفر؛ راه گُریز ٢. پرش‌کننده

**بازبەند** / bazbend/: ناو. بازووبەند؛ خشڵی قۆڵ؛ زەنبەری باسک؛ حەمایەلی بە مت‌ومۆرەوە کە لە سەرووی ئانیشک دەبەسرێ 🇮🇷 بازوبند

**بازپرسی** / bazpirsî/: ناو. کاری پرسینەوە و بە سەر کردنەوە بۆ دەرخستنی ڕاستی و ناسینی تاوانبار 🇮🇷 بازپرسی

**بازپەڕێن** / bazpeřên/: ناو. بازەوان؛ قووشچی؛ ئەو کەسەی لە ڕاوە بازدا باز بەرەو نێچیر

هەڵدەفڕێنێ ☰ بازپران؛ قوشچی

**بازجۆ / bazco/**: ناو. کەسێ کە کاری لێپرسینەوەی سەرەتاییە ☰ بازجو

**بازجۆیی / bazcoyî/**: ناو. بازجوویی؛ کار و ڕەوتی لێپرسین و شوێن گرتن ‹ئەم بازجۆییە چییە لە منی دەکەی؟›. هەروەها: **بازجۆیی کردن** ☰ بازجویی

**بازجوویی / bazcûyî/**: ☜ **بازجۆیی**

**بازد / bazd/**: ناو. باز؛ شەقاوی هەڵبەزینەوە ☰ پرش

◘ **بازد بردن/ دان**: هەڵبەزین؛ هەڵبەزینەوە ☰ پریدن

**بازدایی / bazdayî/**: ئاوەڵناو. دەرچوو؛ هەڵاتوو ☰ فراری

**بازدبازدێن / bazdbazdên/**: ☜ **بازبازان**

**بازدبازۆکێ / bazdbazokê/**: ☜ **بازبازان**

**بازدەبەران / bazdeberan/**: ناو. بازەبەران؛ دوامین حەوتەی ڕەشەمە کە خۆر لە ئاوابووندا جێگۆڕکێ دەکا و دەراو هەراوتر دەکا ☰ آخرین هفتەی اسفند

**بازدەر / bazder/**: ☜ **بازبەر-٢**

**بازدەڵباز / bazdełbaz/**: ☜ **بازبازان**

**بازدەڵبازد / bazdełbazd/**: ☜ **بازبازان**

**بازرگان / bazirgan/**: ناو. بازاڕوان؛ تاجر؛ سەوداگەر؛ مامەڵەچی؛ ماڵفرۆش ‹بەڵێ هەن و یەکجار زۆرن/ بازرگانی فرمێسک و خوێن «هێمن»› ☰ بازرگان

**بازرگانی / bazirganî/**: ناو. بازاڕوانی؛ کار و ڕەوتی کڕین و فرۆشتن یا ناردن و هاوردنی کاڵای کەلان بۆ قازانج ☰ بازرگانی

**بازرە[1] / bazre/**: ناو. ١. کەوانە؛ دۆخی گەڕانەوەی هاوێژراو پاش وێکەوتنی لە شتێکی ڕەق ‹بەردێکی هاویشت، دای لە دیوارەکە، بازرەی کرد و سەرمی شکاند!› ٢. ڕەوتی دەرپەڕین و تەرە بوون؛ باز بردن ☰ ١. کمانه ٢. گریز

◘ **بازرە کردن/ کردنەوە**: ١. کەوانە کردن/ کردنەوە ٢. ڕەواندنەوە؛ ڕەڤاندن؛ بوونە هۆی دەرچوونی کەس یان شتێک ‹بۆ بازرەت کرد؟› ☰ ١. کمانه کردن ٢. فراری دادن

**بازرە[2]**: ئاوەڵناو. بەرەزە؛ تەرە؛ بازبردوو ‹کەوریشکەکە لە لان دەرپەڕی و بازرە بوو› ☰ گریخته؛ فراری

◘ **بازرە بوون**: تەرە بوون؛ هەڵاتن ‹تۆ ئەگەر تاوانبار نیت، بۆ بازرە بووی؟› ☰ گریختن

**بازرە کردن**: تەرە کردن ‹ئەگەر تاوانبار نەبوو، بۆ بازرەت کرد؟› ☰ فراری دادن

**بازرەبوو / baz(i)rebû/**: ئاوەڵناو. زرووقاو؛ زڕیاگ؛ بازرە (نەچیر) ☰ از ترس متواری‌شده (شکار)

**بازرەقە / bazreqe/**: ناو. ١. بازرە؛ ڕەوتی باز بردن و دەرپەڕین ‹هەر لە یەکەم بازرەقەوە/ حیلەی شاخ و هاژەی مێژوو/ گفەی زام و .../ بارانی شیعری ئێمەتان لەگەڵدا بوو «شێرکۆ»› ٢. فیچقە (ئاو، خوێن یان تراوێکی تر) ☰ ١. گُریز ٢. فَوَران

◘ **بازرەقە بەستن**: ١. کەوانە کردن ٢. فیچقە کردن ☰ ١. کمانه کردن ٢. فَوَران کردن

**بازرێشک / bazirîşk/**: ☜ **باسریشک**

**بازڕ / bazîř/**: ناو. بازۆر؛ بازۆری؛ سەماکەرە؛ مشک‌گرە؛ هەلەکەسەمای گەورە؛ مەلێکی ڕاوچی گچکەیە لە خێزانی شمقاڕان، بە ٣٤ سانتیمتر درێژی، باڵی نووک‌تیژ و کلکی باریکەوە، لە ئاسمان لەنگەر دەبەستێ و باڵ لێ دەدا و بۆ گرتنی نێچیر لوور دەبێتەوە، لە چیمەن، قەراخ چۆمان و تەنانەت نزیک ئاوایی دەژی ☰ دلیجه

**بازڤیرک / bazvîrik/**: ناو. گێژەڵووکە؛ گەردەلوول؛ باگێژە ☰ گردباد

**بازقەپان / bazqepan/**: ناو. باسقەپان؛ تیژمار؛ جۆرێک ماری زەردی ئاماڵ‌سوورە ☰ نوعی مار زردرنگ

**بازکەر / bazker/**: ئاوەڵناو. کەرەوە؛ ئاوەڵاکەر ☰ گشاینده

**بازگ**[1] / bazig/: ☜ **باسك ـ۲**

**بازگ**[2]: ئاوەڵناو. بازوو؛ بازە؛ بازەڵە؛ بازی؛ بەوز؛ بۆز؛ ئەبلەق؛ ڕەش و سپی؛ جنجربەڵەک؛ دوو ڕەنگ، بەتایبەت ڕەش و سپی ☰ ابلق

**بازگوڕ** / bazguř/: ناو. ۱. یارمەتی؛ یاریدە و کۆمەگ؛ هاریکاری ۲. هیوا و هومێد ☰ ۱. کمک ۲. امید

**بازگە** / bazge/: ناو. ۱. جێگەی بازدان ۲. ڕێگەی هاتوچۆ(ی بزنەکێوی) ۳. شوێن و خاڵی پەڕینەوە ‹پرسیم لە سیروان بۆچی وا لێلی؟/ بەهار و پاییز ڕێ بازگەی خێڵی «فولکلۆر»› ☰ ۱. محل پرش ۲. گذرگاه بُز کوهی ۳. گُدار

**بازگەشت** / bazgeşt/: ئاوەڵناو. پێژیوان؛ پەشیمان ☰ پشیمان

**بازگی** / baz(i)gî/: ناو. بەڵەکی؛ دووڕەنگی ☰ ابلقی

**بازمان** / bazman/: ناو. پاشەکەوت؛ لێبەجێماو ☰ پس‌انداز

**بازمەلە** / bazmele/: ☜ **باسکەمەلە**

**بازن** / bazin/: ناو. بازند؛ بازنک؛ بازنگ؛ بازنە؛ بازەند؛ خرخاڵ؛ خلخاڵ؛ خرخرە؛ گلۆر؛ مووچەوانە؛ ملدەس؛ ملدەسی؛ دەسینە؛ دەسینک؛ دەسینگ؛ دەزونک؛ دەستەوانە؛ خشڵی خڕی مەچەک، ژنان لە دەستی دەکەن ‹... ئەوە کوڕ دەڵێ: ئەمن چ بکەمێ بۆ قاسیدێکی بە متمانان؟ بینێرمەوە خزمەت کورتەکابانێ زەند بە بازن، بزانم ماوەتەوە لە سەر قەول و قەراری دە هەوەڵێ؟ ... «بەیت»› ☰ النگو

**بازند** / bazind/: ☜ **بازن**

**بازنک** / bazink/: ☜ **بازن**

**بازنگ** / bazing/: ☜ **بازن**

**بازنگە** / bazinge/: ☜ **بازننە**

**بازنۆکە** / baz(i)noke/: ناو. بەربازن؛ بازنەی چووک بۆ دانەکەوتنی بازنە ☰ النگوی کوچک

**بازنە** / bazne/: ناو. ۱. بازن؛ خرخاڵ؛ گلۆر؛ مووچەوانە؛ دەستەوانە؛ خشڵی خڕی مەچەک ‹هەوری لە کۆڵ، بازنە لە قۆڵ، سنگ نەرمونۆڵ ...«فولکلۆر»› ۲. جەغز؛ دایرە ۳. ئاڵقە؛ گەو؛ کەمە ٤. گەوی ئاسن کە لە شکستەی دەهاڵێن ☰ ۱. النگو ۲. دایره ۳. حلقه ۴. حلقه‌ی آهنی

**بازنەگاسن** / baznegasin/: ناو. ئاڵقەی ئاسن کە دەخرێتە سەر گاسنی درزدار ☰ حلقه‌ی گاوآهن

**بازوبرد** / baz û bird/: ئاوەڵکار. هاتوچۆی خێرا و بەلەز ‹بازوبردێک چوومە مەریوان و گەڕامەوە› ☰ فشنگی

**بازوەن** / bazwen/: ☜ **بازووبەند**

**بازۆر** / bazor/: ناو. ۱. ☜ **بازڕ** ۲. ڕەشەبا؛ بای زۆر توند ☰ ۱. ☜ **بازڕ** ۲. تُندباد

**بازۆری** / bazorî/: ☜ **بازڕ**

**بازوو**[1] / bazû/: ناو. باسک؛ باهۆ؛ ساکول؛ قۆڵ؛ چەپل؛ بەوش؛ زەند؛ بازووک؛ پەل؛ لە سەری پەنجەوە هەتا شان ‹بە عەشقی شیرین تەشویی ئەوەشان/ بە زۆری بازوو کێوی ئەڕووخان «پیرەمێرد»› ☰ بازو

**بازوو**[2]: ☜ **بازگ**[2]

**بازووبەن** / bazûben/: ☜ **بازووبەند**

**بازووبەند** / bazûbend/: ناو. بازووبەن؛ بازبەند؛ بازوەن؛ بازیوەن؛ قۆڵبەند؛ قۆڵەوانە؛ زەنبەری باسک؛ حەمایەلی بە متومۆرەوە کە لە سەرووی ئانیشک دەبەسرێ ☰ بازوبند

**بازووک** / bazûk/: ☜ **بازوو**[1]

**بازە**[1] / baze/: ناو. ۱. جۆرە کووتاڵێکی ئەستوورە ۲. تەرم؛ مەیت؛ جەنازە ۳. ناوی سەگانە ‹بۆرە و بازە› ☰ ۱. نوعی قُماش ۲. جنازه ۳. نامی سگانه

**بازە**[2]: ☜ **بازگ**[2]

**بازەبەر** / bazeber/: ناو. پردەباز؛ بەردی ناو چەم و بوار کە بە سەریا باز ئەدەن بۆ پەڕینەوە ☰ سنگ گُدار

**بازەبەران** / bazeberan/: ☜ **بازدەبەران**

**بازەڵە**[1] / bazełe/: ☜ **بازەڵێن**

**بازەڵـە**[2]: ئاوەڵـناو. بازێڵـە: ١. بـازگ؛ بـازی ٢. شەرمشـکاو ٣. خڕکەڵـە و هـەراش (بـۆ منـداڵ) ‹شـوکور منداڵـەکەتان بازەڵـە بـووە› ▭ ١. ابلـق ٢. ورپریده ٣. درشت و تُپلی (کودک)

⊡ **بازەڵە بەستن**: *[مەجاز]* دڵ فێری دڵداری بـوون (بۆ تازەلاوان) ▭ عاشقی آموختن

**بازەڵە خوێندن**: *[مەجاز]* بـێشـەرم و بـوێر بـوون ‹ڕزگار تەواو بازەڵەی خوێندووە› ▭ شرم ریختن

**بازەڵێن** / bazełên/: ناو. بازەڵە؛ قەمچان؛ ڕێخـان؛ هەڵـمەقۆ؛ گەمەیەکـە بـە پێـنج پـەڵ دەکـرێ، هەڵیدەدەن و دەیگرنەوە ▭ بازی یەقول‌دوقول

**بازەند** / bazend/: ☜ **بازن**

**بـازەوان** / bazewan/: نـاو. ئاگـاداری بـازی ڕاو ▭ بازدار؛ نگهبان باز شکاری

**بازەی**[1] / bazey/: ئاوەڵناو. هەندێ؛ بازێ ▭ بعضی

**بـازەی**[2]: ئاوەڵکار. دیسان؛ هەمیسان؛ هـەم دیسـان ▭ باز هم

**بـازی**[1] / bazî/: ناو. ١. گەمـە؛ گاڵـتە ٢. وەردێنــە؛ وەردەنە ▭ ١. بازی ٢. وردنه

**بازی**[2]: ☜ **بازگ**

**- بازی**[3]: پاشەوشە. ١. دۆخی بەخت کردن ‹گیانبازی؛ سەربازی› ٢. دۆستی ‹کۆتربازی› ٣. ئارەزوو کردن ‹لە کەنعانی فێراق و جانگودازیدا وەکوو یـەعقووب/ لـە میسری ئیشتیاق و عیشقبازیدا زولەیخا خۆم «بێخود»› ٤. ئاکار؛ کرد ‹فێڵبازی› ٥. کایە کـردن ‹پـەتبازی؛ تۆپبازی› ▭ ١تا٥ ـ بازی

**بازیار** / bazyar/: ناو. ڕێبگار؛ ڕێبوار ▭ رهگذر

**بازیبەند** / bazîbend/: ☜ **بازوبەند**

**بازیچە** / bazîçe/: نـاو. لەیستۆک؛ ئامرازی گاڵتە و سەرگەرمی ▭ بازیچه

**بازین** / bazîn/: چاوگ. دۆڕان؛ دانان ‹سـەرت پـێ لازمە، مەیبازە مەحوی!/ دەبێ دڵبەر کە هات، ئێمـە بە سەر چین «مەحوی»› ▭ باختن

**بازیوەن** / bazîwen/: ☜ **بازوبەند**

**بازێ**[1] / bazê/: ئاوەڵناو. بازێک؛ بڕێ؛ هێندێ ‹بازێ مرۆ بێ وازن› ▭ بعضی

**بازێ**[2]: ئاوەڵکار. بازێک؛ بڕێ؛ هێندێ ‹بازێ دابـەزین و بازێکیش گوێیان نەدا و ڕۆیشتن› ▭ بعضی

**بازێک** / bazêk/: ☜ **بازێ**

**بازێڵە** / bazêłe/: ☜ **بازەڵە**

**باژ**[1] / baj/: ناو. بەرتیل؛ باج ▭ باج

**باژ**[2]: ئاوەڵکار. دیسان؛ هەمیسان ▭ باز

**باژار** / bajar/: ☜ **باژاڕ**

**باژاڕ** / bajař/: ناو. باژار: ١. شـار ٢. شـارۆچکە ▭ ١. شهر ٢. شهرک

**باژاڕک** / bajařik/: ☜ **باژاڕۆک**

**بـاژاڕۆک** / bajařok/: نـاو. بـاژاڕک؛ شـارۆچکە ▭ شهرک

**باژاڕی** / bajařî/: ناو. شارستانی؛ خەڵکی بـاژێر ▭ شهرستانی

**باژانسۆر** / bajanasor/: ناو. تەماتە ▭ گوجەفرنگی

**باژنە** / bajne/: ناو. پانیە؛ پاژنە ▭ پاشنه

**بـاژۆ** / bajo/: نـاو. گەمیـەیێ بـادەوەی هـەبێ ▭ کشتی بادبانی

**بـاژۆر** / bajor/: نـاو. کەڵکەڵـە؛ خولیـا؛ خـەیاڵ و هەوەس ▭ هوا و هوس

⊡ **وە بـاژۆر کـەوتن**: هـەوا و کەڵکەڵـەی کـارێ کەوتنە سەر ‹ئازاد وە بـاژۆر کـەوتووە ئـەو کچـە بخوازێ!› ▭ به سر افتادن

**باژەڵـە** / bajełe/: نـاو. ١. ☜ **بـازرە** ٢. باژیلـە؛ نەخۆشییەکی پێستە تایبەتی منداڵان، زیپکەیان لە دەست و پێ دێت ٣. مووروویەکە بۆ دەرمـانی ئەو نەخۆشییە ▭ ١. ☜ **بازرە** ٢. از بیمـاری‌هـای پوستی کودکان ٣. نوعی خرزه

**باژەن / bajen/**: ناو. ١. باوەشێن؛ بارۆشە ٢. نێرییە کێوی ☰ ١. بادبزن ٢. بُز کوهی نَر

**باژێلە / bajîle/**: ناو. ١. ☜ **باژەڵە-٢** ٢. نەخۆشی بەر مسوڵدانی منااڵ کە میـزی پـێ نـاکرێ ☰ ١. ☜ **باژەڵە -٢** ٢. بیماری شاش‌بند کودکان

**باژێر / bajêr/**: ناو. باژێڕ: ١. شار؛ شارۆکە ٢. بازار؛ بازاڕ ☰ ١. شهر ٢. بازار

**باژێرسازی / bajêrsazî/**: ناو. شارسازی ☰ شهرسازی

**باژێرڤان / bajêrvan/**: نـاو. شــارەوان؛ شــارەدار؛ بەڕێوەبەری مەزرینگەی شارەوانی ☰ شهردار

**باژێرڤانی / bajêrvanî/**: ناو. شارەوانی ☰ شهرداری

**بـاژێری / bajêrî/**: ئاوەڵـناو. شارسـتانی؛ بـاژاڕی ☰ شهرستانی

**باژێڕ / bajêř/**: ☜ **باژێر**

**باژێڕی / bajêřî/**: ناو. شاروەری؛ شەهرواری؛ کاری ژیان لە شار ☰ شهرنشینی

**باژێلە / bajêle/**: ئاوەڵناو. ئاوارە؛ دەربەدەر ☰ آوارە

**باژێلەتی / bajêletî/**: ناو. ئاوارەیی؛ دەربەدەری ☰ آوارگی

**باژێڵە/ bajêłe/**: ناو. ١. ☜ **بازرە** ٢. ☜ **باژەڵە -٢**

**بـاس¹ / bas/**: نـاو. واس: ١. ڕەوتی لـێ‌دوان؛ قسـە کردن ‹باسی شەو مەکە! نە شایەری شەوم «سـوارە»› ٢. خەبەر؛ هەواڵ ‹کە تـۆ هـاتی لـە نەومیـدی نـەما باس/ لە هیجر و ئینتیزار ئیدی نەما بـاس «نـالی»› ٣. بابەت ‹باسی زولفی درێژ و چاوی بەخەو/ نەبراوە، بووە تڕی خەسرەو! «حاجی قـادر»› ٤. *[مووسیقا]* دەنگـی گڕی گۆرانی‌بێژی پیاو ٥. *[مووسیقا]* بەگرمـەترین و گەورەترین سازی ژێدار لە ئورکیستردا ☰ ١. بحـث ٢. خبر ٣. موضوع ٤و٥. باس

▣ **باسی سەر** *[مەجاز]* تۆکز؛ بڤە؛ قسە یان کارێ کە سەر بە با دەدا ☰ امر خطرناک

▣ **باس کردن**: ١. دەربارەی شتێ یان کەسێ قسە و وتـوویـژ کـردن ٢. لێکۆڵـینەوە؛ تۆژینـەوە سەبارەت بە بابەتێ یا شتێ ☰ ١. گفتگو کـردن ٢. تحلیل کردن

**باسیشی نەکردن**: قسەی لێوە نەکردن؛ جێ قسـە و باس نـەبوون ‹ئـەم مالـەم بفرۆشـم؟ باسیشـی مەکە!› ☰ حرفش را هم نزدن

**باسی کەس/ شتێ نەکردن**: کار پێوە نەبوون؛ کاری بـە سـەرەوە نـەبوون ‹دوای ئـەو کارەسـاتە بـە سەریدا هێنایان، چیتر باسی ناکـەم، کـاری ڕاسـت بێ!› ☰ کاری به کار کسی/ چیزی نداشتن

**باس²**: ئاوەڵناو. *[مووسیقا]* ١. گڕ؛ دەنگـی پیاوانـە ٢. بـەم؛ بـۆڵ؛ کـوڕ؛ گـڕترین بەشـی دەنـگ لـە پارچەیەکی مووسیقادا ☰ ١و٢. باس

**باسترغە / bastirğe/**: نـاو. کـار و ڕەوتی ئـاو دانی چەڵتووک بۆ چەکـەرە کـردن ☰ آبیـاری چلتـوک برای جوانه زدن

**باسترمە / bastirme/**: نـاو. باسـتورمە؛ باسـورمە؛ پاسترمە؛ زۆنگ؛ گۆشتی دە ڕیخۆڵـە ئـاخنراو ☰ سوسیس

**باستورمە / basturme/**: ☜ **باسترمە**

**باستوق / bastuq/**: ☜ **باستیك**

**باستۆن / baston/**: ☜ **باتۆم**

**باستیک / bastîk/**: نـاو. باسـتوق؛ باسـوخ؛ باسـوق؛ باسوز؛ باسلق؛ باسلوق؛ تەمسـق؛ بـەنی؛ سـجۆق؛ سنجۆق؛ خواردنێکی شیرینە لە نیشاستە و شیرە و شەکەر دەکرێ ☰ باسلُق

**باسخون / basxûn/**: ناو. ١. ☜ **شەوخونی -١** ٢. پەلاماری کتوپڕ ☰ ١. ☜ **شەوخونی -١** ٢. پاتک

**باسریشک / basrîşk/**: نـاو. بازریشـک؛ بۆران؛ بەفر و باران و با پێکەوە ☰ برف‌گیجە

**باسرە / bas(i)ře/**: ئاوەڵناو. ١. باسەرە؛ باگر؛ بەرەبا؛ باڕۆگ؛ باپێچ؛ تایبەتمەندی شوێنێ کە با بیگـرێ ٢. باهەڵکەر؛ بە تایبەتمەندی هەڵکردنی بـاوە ☰ ١. بادگیر ٢. بادخیز

**باسڕێژ** / basřêj/: ناو. بالگاشەچی؛ پڕوپاگەندەچی ☰ تبلیغاتچی

**باسقول** / basqul/: ناو. گەمارۆی کتوپڕی؛ کار و ڕەوتی لەپڕ ئابلۆقە دان ☰ مُحاصرەی ناگهانی

**باسقەپان** / basqepan/: ☚ **بازقەپان**

**باسقەندە** / basqende/: ☚ **باسقەنە**

**باسقەنگە** / basqenge/: ☚ **باسقەنە**

**باسقەننە** / basqenne/: ☚ **باسقەنە**

**باسقەنە** / basqene/: ناو. باسقەندە؛ باسقەنگە؛ باسقەننە: ١. قەندە؛ کلکەسەبیلەی دارین ٢. *[مەجاز]* بۆری؛ بۆریە؛ لوولە ‹یان باسقەنەی نەوتی، لەپڕ/ بۆ ئاسمانی هەڵدام بەگوڕ «گۆران»› ☰ ١. دستەی بلند چُپُق ٢. لولە

**باسک** / bas(i)k/: ناو. ١. بەوش؛ ساکول؛ گورمرک؛ لە مەچەکەوە تا ئانیشک ‹لە دوژمن ڕاپەڕیوە/ باسکی لێ هەڵمالیوە «هێمن»› ٢. *[مەجاز]* بازگ؛ بازوو؛ بازووک؛ باڵ و قۆڵ؛ لە سەری پەنجەوە تا شان ‹باسکی من و تیشکی ئەوی/ بژیو دەستێنین لە زەوی «هێمن»› ٣. بستوو؛ ملەی کێو ‹لە سەر باسکی ناڵەشکێنێ/ حەسەن زیرەک خۆی دەنوێنێ « حەقیقی»› ٤. مۆدنە؛ دەمنە؛ دارسیغار؛ دار جگەرە ٥. باڵی مەل ☰ ١. ساعد ٢. بازو ٣. ستیغ کوه ۴. چوب سیگاری ۵. بال پرنده

**باسکار** / baskar/: ناو. هێز؛ وزە ☰ توان

**باسکانە** / baskane/: ناو. دووبەرەکی ☰ دودستگی

**باسکبەند** / basikbend/: ناو. بازووبەند ☰ بازوبند

**باسکراو** / baskraw/: ئاوەڵناو. نێوبراو؛ لێدواو ☰ نامبردە

**باسکڵاو** / baskław/: ناو. ١. کلاوبن؛ گەلای ڕێواس؛ ڕێواسی بێنێرتک ٢. ناوی مەلێکە ☰ ١. برگ ریواس ٢. نام پرندەای

**باسکۆ** / basko/: ناو. ١. باسکۆڵ ٢. کاری قرتاندنی باڵی باڵندە ☰ ١. باسکول ٢. کار قیچی کردن بال پرنده

**باسکۆ . باسکۆ** / basko basko/: ناو. باڵەفڕێ؛ کار و ڕەوتی باڵ لێدانی باڵندە ☰ کار بال زدن پرنده

**باسکۆڵ** / baskoł/: ناو. ١. قەپانی گەورە بۆ کێشانی باری قورس ٢. بازپرس؛ فەپرس؛ لێکۆڵ؛ کەسێ کە کاری پرسینەوە بۆ ناسینی تاوانبار و دەرخستنی ڕاستییە ☰ ١. باسکول ٢. بازپرس

**باسکۆڵی** / baskołî/: ناو. کاری پێچانەوە؛ فەپرسی؛ بازپرسی؛ پرسینەوە و بە سەر کردنەوە بۆ دەرخستنی ڕاستی و ناسینی تاوانبار ☰ بازپرسی

**باسکە** / baske/: ناو. ناوی باڵندەیەکە ☰ پرندەای است

**باسکەباسکانی** / baskebaskanî/: ناو. کاری لێک هەڵاواردن ☰ دستەبندی

**باسکەدار** / baskedar/: ناو. دەستەک؛ داری دارەڕا ☰ تیرک

**باسکەسەگ** / baskeseg/: ناو. سەگی باریکەڵەی دووڕە، دایک تاژی و باوک سەگ ☰ سگ دورگەی شکاری

**باسکەمژانە** / baskemijane/: ناو. باسکێش ☰ بازوی دراز خیش

**باسکەمەلە** / baskemele/: ناو. بازمەلە؛ مەلەباسکە؛ جۆرێ مەلە کە بە تەوژمی باسک هاویشتن دەبێ ☰ شنای کرال

**باسکەوجاڕ** / baskewcař/: ☚ **باسکێش**

**باسکێش** / baskêş/: ناو. باسکەوجاڕ؛ مژانە؛ ئێرەقە؛ داری نێوان نیر و دەندە ☰ چوب درازین خیش

**باسلق** / basliq/: ☚ **باستیك**

**باسلوق** / basluq/: ☚ **باستیك**

**باسمباز** / basimbaz/: ناو. حەو ڕۆژی پڕبارانی سەرەبەهار ☰ هفت روز بارانی اوایل بهار

**باسمە** / basme/: ناو. باشمە: ١. مۆر؛ موهر ٢. شقڵی خەرمان ٣. ستامپ؛ دەفر و جەوهەری

قامک لێ نان ☰ ١. مُهر ٢. مُهر خرمن ٣. استامپ

**باسمێل** / bas(i)mêł/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* خۆبایی؛ لووتبەرز؛ بەفیز و خۆڕانەر ☰ مُتکبر

**باسنامه** / basname/: ناو. کتێبی چیرۆکان ☰ کتاب داستان

**باسنەی** / basney/: چاوگ. زریکاندن؛ زیکاندن ☰ جیغ کشیدن

**باسوخ** / basux/: ☜ **باستیك**

**باس‌وخواس** / bas û x(i)was/: ناو. ١. هەواڵ؛ خەبەر؛ دەنگ‌وباس ‹نێچیرگری دەنگ و باس‌وخواسان/ وا ڕیزی وتاری خۆی دەدا سان «هەژار، *مەم و زین*»› ٢. کار و ڕەوتی لێ‌پرسینەوە و دانە بەر گیر و گاز ☰ ١. اخبار ٢. بازخواست

**باسورمه** / basurme/: ☜ **باسترمه**

**باسوز** / basuz/: ☜ **باستیك**

**باسوق** / basuq/: ☜ **باستیك**

**باسۆر** / basor/: ناو. بای سوور؛ بای ممبارەک؛ نەخۆشییەکی گرانە، نەخۆش تای گرانی لێ دێ و لاچاوی سوور دەبێ ☰ بیماری باد سرخ

**باسو** / basû/: ناو. هەرەس؛ کۆمایەکی گەورە لە بەفر کە لە بەرزاییەوە بەر دەبێتەوە ☰ بهمن

**باسوڕە** / basûře/: ناو. گێژەڵووکە ☰ گردباد

**باسەر**[1] / baser/: ناو. بای لە بەرزییەوە ☰ باد فرورو

**باسەر**[2]: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* خۆبایی؛ لووتبەرز ☰ مغرور

**باسەره** / basere/: ☜ **باسرە ـ١**

**باسەری** / baserî/: ناو. *[مەجاز]* لووتبەرزی ☰ غرور

**باسەڕە** / baseře/: ناو. مێرگ و بژوێن و جێ لەوەڕی باش ☰ چراگاه

**باسەواد** / basewad/: ئاوەڵناو. ١. خوێندەوار؛ خوەنەوار؛ سەوادددار ٢. زانا ☰ ١. باسواد ٢. دانا

**باسی** / basî/: ناو. لاسایی؛ دەمەلاسکێ ☰ تقلید؛ ادا

⊡ **باسی کردن**: دەمەلاسکێ کردنەوە؛ لاسایی کردنەوە ☰ تقلید کردن؛ ادا درآوردن

**باش**[1] / baş/: ئاوەڵناو. چاک؛ خاس؛ بە چۆنیەتییەکی دڵخوازەوە ‹کاری باش› ☰ نیکو

**باش**[2]: ئاوەڵکار. ١. چاک ‹باش سەیری بکە!› ٢. نیشانەی هاوڕایی ‹گوتم: بچین؟ گوتی: باش› ٣. نیشانەی نارەزایی ‹وای لێ هات؟ باش› ☰ ١تا٣. خوب

⊡ **باش کردن**: ١. باش کردنەوە؛ چاک کردن/ کردنەوە؛ خاسەو کردن ‹ئەو دەرمانە دەستمی باش کرد/ کردەوە› ٢. کاری چاک کردن؛ خاس کردن ‹باشت کرد سەرت لێ دا› ☰ ١و٢. خوب کردن

**باش کردنەوە**: ☜ **باش کردن ـ١**

**ـباش**[3]: پاشەوشە. ـ باشی؛ سەرەک؛ کاربەدەست ‹سوورباش› ☰ ـ باش

**باشار** / başar/: ناو. ١. ڕەوتی دەربردن؛ خۆ ڕاگرتن ٢. بەرانبەری؛ پێ‌وەستان ‹مافی کوردی هەر دەبێ بستێندرێ، بستێندرێ/ دژمنی کورد تێگەییوە ناکرێ باشاری کورد «هێمن»›. ☰ ١. مقاومت ٢. مقابله

⊡ **باشار بوونەوە**: ☜ **باشار کردن**

**باشار کردن**: باشار بوونەوە؛ پێ‌وێران؛ دەرەقەت هاتن ☰ زور چربیدن

**باشارکەر** / başarker/: ئاوەڵناو. خۆڕاگر؛ بەرگەگر ☰ مقاوم

**باش‌بۆزغ** / başboziğ/: ناو. شوفار؛ سیخوڕ ☰ جاسوس

**باشتر** / baştir/: ئاوەڵناو. خاستر؛ چاکتر ☰ بهتر

**باشترین** / başt(i)rîn/: ئاوەڵناو. سەرتڵ؛ سەرگوڵ؛ هەرەباش ☰ بهترین

**باشتی** / başitî/: ناو. میرات ☰ ماترک متوفی

**باشقه** / başqe/: ئاوەڵناو. سەرتۆپ؛ هەڵکەوتە. هەروەها: **باشقەیی** ☰ سرآمد

**باش‌قەپان** / başqepan/: ناو. جۆرە مارێکی

زەردی ئاماڵ سوورە ☰ نوعی مار

**باشکۆ / baş(i)ko/**: ئاوەڵناو. شـکۆدار؛ ڕێـزدار ☰ باشکوه

**باشکێن / baş(i)kên/**: ئاوەڵناو. هـۆ یـان دەرمـانی لابردنی بای سک ☰ ضد نفخ

**باشگا / başga/**: ناو. یانـە؛ جێگایـەک کـە چەنـد کەسی هاوبیر و ڕا یان هاوکار لێی کۆ دەبنەوە بۆ ڕابواردن و سەرگەرمی ☰ باشگاه

**باشلوخ / başlux/**: ناو. سەرکڵاوی باران دانەدەر ☰ کلاه بارانی

**باشمە / başme/**: ☜ باسمە

**باش‌وبۆش / baş û boş/**: ئاوەڵناو. چـاک و پۆشـتە؛ پۆشتە و پوختە ☰ مُرفه

**باش‌وبۆشی / baş û boşî/**: نـاو. هەڵـەخەرجی؛ دەس‌بڵاوی؛ ڕەوتی ماڵ بە فێڕۆدان ☰ ولخرجی

**باشوێل / başwêl/**: ☜ باشەڵ

**باشو / başû/**: نـاو. باشـووک؛ باشـووکە؛ باشــە؛ باشەواڵە؛ واشە؛ باڵەبان؛ باڵەوان؛ پیتوو؛ مـەلێکی مامناوەندی ڕاوکەرە لە خێزانی بازسانان، بە ٥٠ تا ٥٥ سانتی‌میتر درێژی، پەڕ و باڵـی قـاوەیی، بـەر زگـی پنـۆک ـ پنـۆکی سـپی و لاقـی ڕووت و زەردەوە، کەمێک تەپ دەفـڕێ و لـە کێوپـارەی دوورەدەسـت، زەوی و زار و شـوێنی دارسـتان دەژی. لە سەر ڕەوەزی قـەراغ ئـاو، دار و زووران هێلانە دەکا ☰ قرقی

**باشور / başûr/**: ناو. جەنووب؛ یەکێ لـە چـوار لا سەرەکییەکان، بەرانبەر بە باکوور ☰ جنوب

**باشوک / başûk/**: ☜ باشو

**باشوکە / başûke/**: ☜ باشو

**باشە**[1] **/ başe/**: ☜ باشو

**باشە**[2]: دەنـگ. چاکـە؛ خاسـە؛ وشـەی پەسـند و هاوڕایی کردن ‹باشە، ئەتۆش وەرە!› ☰ باشد

**باشـەوالا / başewala/**: ئاوەڵـناو. لینـگ‌ڕووت؛ بێ‌دەرپێ ☰ بی شلوار

**باشەواڵە / baîewałe/**: ☜ باشو

**باشی**[1] **/ başî/**: نـاو. چاکی؛ خاسی: ١. چاکە؛ کار و ڕەوتی یارمەتی دان و هاوکاری کردنی کەسـێک ‹باشی زیانێکی نییە› ٢. قـەنجی؛ پەسـندی؛ دۆخ یان چۆنیەتی باش بوون ‹لـە باشـی و مرۆڤـایەتیدا هەڵکەوتە بوو› ☰ ١و٢. خوبی

**- باشی**[2]: پاشەوشە. ـ بـاش؛ سـەرەک؛ سەردەسـتە ‹توجارباشی؛ مونشی‌باشی› ☰ ـ باشی

**باشیق / başîq/**: ناو. باڵندەیەکە لە سەقر گـەورەتر و زوو کەوی دەبێ ☰ نوعی شاهین

**باشیل / başîl/**: ئاوەڵناو. باشیلا؛ ئاوارە و دەربـەدەر ☰ خانەبەدوش

**باشیلا / başîla/**: ☜ باشیل

**باشیلە / başîle/**: نـاو. ١. لەچک؛ دەسرۆکەی سەر ٢. بەرهەڵبێنە ٣. چارۆک؛ کۆڵوانە ☰ ١. روسـری کوچک ٢. پیشبند ٣. رودوشی

**باشیم / başîm/**: ئاوەڵناو. باشتی؛ میرات؛ کەلەپوور ☰ ماترک

**باشیمگیر / başîmgîr/**: نـاو. بەشـبەر؛ میراتگـر ☰ وارث

**باشێڵ / başêł/**: ☜ باشەڵ

**بـاع / ba'/**: دەنـگ. دەنگـی مـەڕ و بـەرخ ‹وەرە خلـەخل، بچـۆ نـەرم و شـل/ بباڕێنـە بـاع، بـەرخی چاوبەکل! «گۆران»› ☰ بع ـ بع

**باعانـدن / ba'andin/**: چاوگ. باعـەباع کـردن ☰ بع ـ بع کردن

**باعە / ba'e/**: دەنگەناو. باع ☰ بع

**باعەباع / ba'eba'/**: دەنگەناو. هەرای بـەرخ و مـەڕ ☰ بع ـ بع

**بـاعیس / ba'îs/**: نـاو. بـایس؛ بایسـت؛ بایسـتی؛ باییس؛ هۆ؛ سەبەب ‹هەر فیکری تۆیە باعیسی ژین و حەیاتی مـن/ هـەر زیکـری تۆیـە قـووەتی ئـەژنۆ و

هەناسەمە «بێخود»› ☰ سبب

⊡ **بونە باعیس:** بوونە هۆ/ سەبەب (بۆ شتی خراپ) ‹دوژمنی بێگانە بتبینم هەمیشە پەست و ناشاد/ چۆن ببوویە باعیسی وێرانی ئەم دوو خاکە جوانە؟! «هێمن»› ☰ موجب شدن

**باغ / bağ/:** ☚ باخ[1]

⊡ **باغ برین:** ☚ باخ برین

**باغان / bağan/:** ناو. باخان: ١. شوێنێ پڕ لە باخ و بێستان ‹لە باغان ئاه و نالین دێ، دەڵێن شای نێو گولان ڕۆیی/ لە مەیخانان سەدای شین دێ، مەگەر پیری موغان ڕۆیی «وەفایی»› ٢. شاری لە نێو باخ و باخات ☰ ١. باغستان ٢. باغشهر

**باغبێن / bağbên/:** ☚ باقەبەس

**باغچە / bağçe/:** ☚ باخچە

⊞ **باغچەی ساوایان:** ☚ باخچەی منالان

**باغدار / bağdar/:** ☚ باخدار

**باغداری / bağdarî/:** ☚ باخداری

**باغر / bağir/:** ناوەڵناو. خۆبایی؛ لەخۆدەرچوو؛ بە فیز و هەوا ☰ مغرور

⊡ **باغر بون:** خۆبایی بوون؛ لە خۆ دەرچوون ☰ مغرور شدن

**باغە / bağe/:** ناو. ١. باقە؛ بەستە؛ باقەی گیا و گەنم ٢. شتی چێکراو لە بنێشت یان نەوت ٣. باخە؛ نەخۆشییەکی سمی یەکسم ☰ ١. بافە؛ بستەی گیاه ٢. هرچە از جنس سقّز یا نفت ٣. از بیماری‌های سُم‌داران

**باغەبەن / bağeben/:** ☚ باقەبەس

**باغەبێن / bağebên/:** ☚ باقەبەس

**باغەڵ / bağeł/:** ناو. باخەڵ؛ باخڵ ‹دەستی پانم لە بنی باغەل گرت/ ئابڕووم ویست و سەری خۆم هەڵگرت «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ بغل

**باغەڵبڕ / bağełbiř/:** ☚ باخەڵبڕ

**باغەوان / bağewan/:** ☚ باخەوان

**باغەوانی / bağewanî/:** ☚ باخەوانی

**باغەوبەس / bağewbes/:** ☚ باقەبەس

**. باف / baf/-:** پاشەوشە. ـ چن؛ ـ هۆن ‹جاجمباف› ☰ ـ باف

**بافت / baft/:** ناو. ١. شیاوی؛ ڕەوایی ‹بافتی ئەم کارە نییە!› ٢. هۆنە؛ هۆندراو ‹کەوای زێڕبافتی لە بەرە!› ٣. خەرج؛ بەخت ‹سەیدی هەر چێش بێ، بافتی ڕای تۆش کەرد/ گەردوون چی ڕانە ها ڕەنجەڕۆش کەرد «سەیدی»›. هەروەها: **بافت کردن** ☰ ١. شایستگی ٢. بافت ٣. خرج

**بافتە / bafte/:** ناو. تیزماڵکی هۆندراو کە لە پەراوێزی عەبای دەدوورن ☰ نوار حاشیەی عبا

**بافرۆ / bafro/:** ناو. بوختان و درۆ ☰ بُهتان

**بافرە[1] / bafre/:** ناو. کەتیرەی سپی و بێخەوش ☰ کتیرای مرغوب

**بافرە[2]:** ناوەڵناو. خۆبایی؛ بادیهەوا ☰ مغرور

**بافڕکە / bafiřke/:** ناو. فڕفڕەی کاغەزی ☰ فرفرەی کاغذی

**بافڕۆک / baf(i)řok/:** ناو. باڵندە؛ فڕندە ☰ پرندە

**بافڕە / baf(i)ře/:** ناو. فڕفڕە؛ هەرچی بە با دەخولێتەوە ☰ بادفر

**بافس / bafis/:** ناو. باقۆفە؛ میوەی وەزیوی ڕزیو ☰ میوە ریختەی پوک شدە

**بافک / bafik/:** ناو. بیانوو؛ پەلپ ☰ بهانە

**بافڵ / bafił/:** ناو. تافگە؛ ئاوهەڵدێر؛ سەرووەشێن ‹لەم ڕەنگە بەو لاوە، بافلی ڕەنگەکان لە چاوما ئەگۆڕم «شێرکۆ»› ☰ آبشار

**بافڵە / bafłeh/:** ناو. نۆموسوڵمانی کۆنەخاچپەرست ☰ مسیحی تازە مسلمان شدە

**بافور / bafûr/:** ناو. ١. تریاک ٢. وافوور؛ ئەسبابی تریاک کێشان ☰ ١. تریاک ٢. بافور

**بافە / bafe/:** ☚ باقە[1]ـ١

**بافەدەنگ / bafedeng/:** ناوەڵناو. خۆهەڵکێش؛

بافیش‌کەر 🇮🇷 خودپسند

**- بافی / bafî-/**: پاشەوشە. ـ چنی ‹وا دیارە سەرم لە فەلسەفەبافی ناوە، کە هیچ لە دەموکاوێژی من ناوەشێتەوە! «هەژار، چێشتی مجێور»› 🇮🇷 ـ بافی

**بافیاگ / bafyag/**: ئاوەڵناو. ۱. هۆنراو؛ هۆندراو؛ هۆنە ۲. هەڵبەستە و ناڕاست (قسە) 🇮🇷 ۱. بافتە ۲. ساختگی (سُخن)

**بافیش / bafîş/**: ناو. خۆهەڵکێشی؛ کاری بە خۆدا هەڵگوتن ‹نەرگس لای وا بوو وەک چاوی تۆیە/ لە خۆشییان کردییە فیشال و بافیش «هەژار، بۆ کوردستان»› 🇮🇷 خودستایی

**بافیشکەر / bafîşker/**: ئاوەڵناو. ۱. بافەدەنگ؛ خۆپەسند ۲. چاپچی؛ شاتوشووتکەر 🇮🇷 ۱. خودپسند ۲. دروغگو

**بافین / bafîn/**: چاوگ. ۱. هۆنینەوە؛ چنین ۲. *[کینایە]* ورلێدان؛ قسەی پووچ و بنشڕ کردن ‹هات دانیشت فرەیەکی بافی، کەس بایەخی پێ نەدا، هەڵسا چوو!› 🇮🇷 ۱. بافتن ۲. ژاژخاییدن

**باڤ[1] / bav/**: ☜ **باوک**

**- باڤ[2]**: پاشگر. شێوە ‹زەرباڤ› 🇮🇷 ـ فام

**باڤبرا / bavb(i)ra/**: ناو. برای باوکی؛ برای لە دایکی تر 🇮🇷 برادر پدری

**باڤماری / bavmarî/**: ناو. زڕباب؛ باواپیارە 🇮🇷 ناپدری

**باڤەرینگ / baverîng/**: ☜ **باوەڕێن**

**باڤی / bavî/**: ☜ **بادام**

**باڤیتن / bavîtin/**: چاوگ. خستن؛ هاویشتن ‹مەحبووب ب عەینێ کەوکەبن، رەقسا کو تێ دلبەر هەبن/ سەد جان گرانێ من هەبن، باڤێمە رێ، ئەرزانە رەقس «مەلای جزیری»› 🇮🇷 انداختن

**باڤیتی / bavîtî/**: ناو. باڤینی؛ باوکیەتی؛ باوکێتی 🇮🇷 پدری

**باڤینی / bavînî/**: ☜ **باڤیتی**

**باق / baq/**: ناو. ۱. مووچ؛ قولاپە؛ گرێی دەست و پا ۲. سەلکە پیاز و سیر ۳. قەزوانی فەریک 🇮🇷 ۱. مچ ۲. غدەی سیر و پیاز ۳. چاتلانقوش دلمل

**باقاندن / baqandin/**: چاوگ. باقانن؛ هاوار کردنی جانەوەری وەک ڕێوی لە نەخۆشی 🇮🇷 واق ـ واق کردن

**باقانن / baqanin/**: ☜ **باقاندن**

**باق ـ باق / baq baq/**: دەنگەناو. باقەباق؛ دەنگی ڕێوی و چەقەڵ 🇮🇷 واق ـ واق

**باقر[1] / baqir/**: ناو. ۱. مس ۲. مسی قەلایی لێ نەدراو ۳. دەفری مسینە کە قەلاییەکەی سێورابێت و سوورایی مسەکە دەرکەوتبێت ٤. ژەنگی مس *[کینایە]* ٥. عەیبی داپۆشراو 🇮🇷 ۱. مس ۲. مس سفید نشده ۳. ظرف مسی قلع رفته ۴. زنگ مس ۵. عیب پوشانیده

**باقر[2]**: ئاوەڵناو. ڕووداماڵاو؛ بێ‌حەیا 🇮🇷 بی‌شرم

⊡ **باقر بون**: *[مەجاز]* عەیب دەرکەوتن 🇮🇷 رسوا شدن

**باقلاو / baqlaw/**: ناو. شێوی باقلە و ئاو و ڕۆن 🇮🇷 آش باقلا

**باقلاوا / baqlawa/**: ناو. بەقلاوە؛ بەقلەوا: ۱. جۆرێ پێخۆر لە تێکۆشینی ڕۆن و دۆشاو ۲. باقلەوا 🇮🇷 ۱. نوعی غذا ۲. باقلوا

**باقلک / baqilk/**: ناو. باقلە؛ پاقلە 🇮🇷 باقلا

**باقلە / baqle/**: ناو. باقلە؛ پاقلە؛ باقیلە؛ بلوول: ۱. دانەوێڵەیەکە لە کەلوودا دەبێ و دەنک پان و درشتە، لە لۆبیا دەچێ و لەو زلترە ۲. بەری گیای «لۆ» کە ڕوەکێکی گەلادەرزی وەک «کەما»یە 🇮🇷 ۱. باقلا ۲. ثمر گیاهی برگ سوزنی

**باقلە پلاو / baqlep(i)ław/**: ناو. پلاو بە باقلە و گۆشتەوە 🇮🇷 باقالی‌پلو

**باقلەک / baqlek/**: ☜ **بادرو**

**باقلەکێوی / baqlekêwî/**: ناو. بۆقلی؛ جۆرێ

باقلەی ورد ≌ باقلای وحشی

**باقلەوا** / baqlewa/: ناو. باقلاوا؛ شیرینییەکە بەناوبانگ لە ئارد و ڕۆن و هێلکە و شەکر و پستە و بادام ≌ باقلوا

**باقوەس** / baqwes/: ☜ باقەبەس

**باقۆ** / baqo/: ناو. ١. بز؛ جۆرێ ماسی لووسی سمێڵداری دەم گەورە ٢. هەنجیری هێشتا نەگەیشتوو ٣. قەزوانی فەریک ≌ ١. نوعی ماهی ٢. انجیر کال ٣. چاتلانقوش کال

**باقۆتە** / baqote/: ناو. باق؛ نێرتکی پیاز و سیر ≌ غدەی پیاز و سیر

**باقۆرە** / baqore/: ☜ باقۆڕە

**باقۆڕە**[1] / baqoře/: ناو. باقۆرە؛ کودەڵە بەراز؛ بەچکە بەراز ≌ بچەخوک

**باقۆڕە**[2]: ئاوەڵناو. باقۆرە؛ زلحۆل؛ زەبەلاح و تەژە ≌ لندهور

**باقۆشە** / baqoşe/: ناو. ١. میوەی نەگەییو ٢. باڕێزە ≌ ١. میوەی نارس ٢. میوەی زیردرختی پلاسیدە

**باقۆفە** / baqofe/: ناو. بافس؛ باکۆفە؛ باقۆڤە؛ باقۆشە؛ میوەی وەریوی ڕزیو ≌ میوەی زیردرختی پوک شدە

**باقۆڤە** / baqove/: ☜ باقۆفە

**باقۆڵە** / baqołe/: ☜ بزەڵە

**باقۆیی** / baqoyî/: ناو. بەلەباقە؛ دەردێکی ئاژەڵە ≌ نوعی بیماری بز و گوسفند

**باقوور** / baqûr/: ناو. کەتە مەڕ و ڕان ≌ رمەی گوسفند

**باقە**[1] / baqe/: ناو. ١. باخە؛ باغە؛ بافە؛ باوەشێک گیا یان دەغڵی بەستراو ‹کە بمرێ عاشقی زاری، مەلائیک بێن و بیبینن/ دەڵێن ئەم باقە چیلکە ناگرێ یا ڕەب بەری گۆپاڵ! «مەحوی»› ٢. نەخۆشییەکی حەچەیە ≌ ١. بافە ٢. از بیماری‌های بُز

**باقە**[2]: دەنگەناو. واقە؛ هەرا و زیوەی ڕێوی و ... ≌ واق ـ واق

**باقەباق** / baqebaq/: دەنگەناو. واقەواق؛ دەنگی ڕێوی و بزن و کار ≌ باق ـ باق

**باقەبزن** / baqeb(i)zin/: ☜ بزەباقە

**باقەبزە** / baqeb(i)ze/: ناو. بەلەباقە؛ نەخۆشینی کوتوپڕی ئاژاڵ ≌ مرض گوسفند و بز

**باقەبەس** / baqebes/: ناو. باخەبێن؛ باغبێن؛ باغەبەن؛ باغەبێن؛ باقەبێن؛ باغەوبەس؛ باقوەس؛ باقەبەست؛ باقەوەس؛ ئەو شووڵ یا گیایەی باقەی پێ دەبەستن ≌ گیاه بستن بافه

**باقەبەست** / baqebest/: ☜ باقەبەس

**باقەبێن** / baqebên/: ☜ باقەبەس

**باقەگیا** / baqeg(i)ya/: ناو. دەستی ≌ بستەی گیاه

**باقەوەس** / baqewes/: ☜ باقەبەس

**باقی**[1] / baqî/: ناو. ماوە؛ پاشماوە ‹حاڵش بەدتەورەن بە ئایەی کەلام/ ئیختیار بە تۆن، باقی وەسسەلام «سەیدی»› ≌ باقیماندە

**باقی**[2]: ئاوەڵناو. هەرماو ‹ئێمە گشت فانی هەر ئەوەن باقی/ نازوون وە بازووی پڕ نەیرووی ساقی «مەولەوی»› ≌ باقی

**باقیلە** / baqîle/: ☜ باقلە

**باقیماو** / baqîmaw/: ناو. پاشمەندە؛ پاشمەنە؛ ماگە؛ مەندە ≌ باقیماندە

**باقیە** / baqye/: ☜ بەقیە

**باک** / bak/: ناو. ١. ترس؛ خۆف ‹کە تۆی شای کەچکولاهی دیدەمەستان/ چ باکم قەیسەر و فەغفوورە ئەمشەو «نالی»› ٢. دەفری جێ سووتەمەنی لە ماشیندا ≌ ١. ترس ٢. مخزن سوخت

**باکردگ** / bakirdig/: ☜ باکردوو

**باکردوو** / bakirdû/: ئاوەڵناو. باکردگ؛ باکردی: ١.

ماسیو؛ پەنەماو ٢. *[کینایە]* تایبەتمەندی شتی فرۆش کە بە سەر دەستی فرۆشیارەوە مابێتەوە و نەفرۆشرێت ☰ ١. آماسیده ٢. بادکرده؛ فروش نرفته

**باکردی / bakirdî**/: ☜ **باکردو**

**باکرۆڤە / bak(i)rove**/: ناو. کرێوە؛ بۆران؛ بەفر بە باوە ☰ بوران

**باکوت / bakut**/: ☜ **باڕن**

**باکوزیرک / bakuzîrk**/: ناو. با و بۆران؛ تۆف و کرێوە و بادەوە ☰ کولاک

**باکۆفە / bakofe**/: ☜ **باقۆفە**

**باکۆڤە / bakove**/: ناو. باقۆفە؛ میوەی ڕزیوی با وەراندوو ☰ میوەی بادریختەی پوک شده

**باکور / bakûr**/: ناو. لاژوور؛ یەکێ لە چوار لا سەرەکییەکان، بەرانبەر بە باشوور (... خەبات بکەن کە زاراوە لێک جیاوازەکانی باکوور و باشوور و ڕۆژاوا، تا لورستان بگەیەننەوە یەک و ... «هەژار، چێشتی مجێور»). هەروەها: **باکووری** ☰ شُمال

**باکوڕە / bakûře**/: ناو. گۆچان؛ گۆپاڵ؛ داردەستی سەرچەمیو ☰ چوگان

**باکوزک / bakûzik**/: ناو. باکووسک؛ سۆزەی سەرما؛ بای زۆر ساردی زستان ☰ باد سرد زمستانی

**باکوسک / bakûsik**/: ☜ **باکوزک**

**باکەش / bakeş**/: ناو. ١. بابوێر؛ کەلێنێ بای پێدا دێ ٢. کەڵەشاخی حەجامەت‌کێش؛ کووپێ کە لە پشتی ئێشاوی دەگرن ٣. لوولەسۆبە؛ بۆریەی کوورە ☰ ١. منفذ باد ٢. بادکش ٣. لولەی بخاری

◘ **باکەش گرتن**: کەڵەشاخ گرتن بێ‌نەشتەر لێدان ☰ بادکش گرفتن

**باکەف / bakef**/: ناو. باگەف؛ خشتی هەڵکفاوی تەواو لە کڵ‌دەرنەچوو ☰ آجر نیم‌پخته

**باکێش / bakêş**/: ناو. باکەش ☰ بادکش

**باگ / bag**/: ناو. با ☰ باد

**باگا / baga**/: ناو. شوێنی باگر ☰ منفذ باد

**باگر / bagir**/: ناوەڵناو. باپێچ؛ باگرە؛ باگیر؛ بەربا؛ بەرەبا؛ لابا؛ لاباد؛ بائەنگێو؛ باسەرە؛ باسرە؛ باڕۆگ؛ تایبەتمەندی شوێنێ کە با بیگرێ ☰ بادگیر

**باگردان / bagirdan**/: ☜ **بانگلێر**

**باگردێن / begirdên**/: ☜ **بانگلێر**

**باگرۆ / bag(i)ro**/: ناو. گژەبا؛ بای توند ☰ تندباد

**باگرۆکە / bag(i)roke**/: ناو. گێژەڵووکە ☰ گردباد

**باگرە / bag(i)re**/: ☜ **باگر**

**باگژە / bag(i)je**/: ناو. ١. بای نێوانجی شەماڵ و زریان ٢. ☜ **باگێژە** ☰ ١. باد میانەی شمال و جنوب ٢. ☜ **باگێژە**

**باگوردان / bagurdan**/: ☜ **بانگلێر**

**باگوردێن / bagurdên**/: ☜ **بانگلێر**

**باگوڕ[1] / baguř**/: ناو. باگوڕک؛ هەرەوەز؛ زبارە ☰ همیاری

**باگوڕ[2]**: ناوەڵناو. ئابوونە؛ بەشداری؛ ئەندامییەتی ☰ آبونە

**باگوڕک / baguřk**/: ☜ **باگوڕ[1]**

**باگونە / bagune**/: ناو. نەخۆشی گون پەنەمان لە بەر قەڵەوی ☰ بیماری وَرَم بیضە

**باگوێ / bag(i)wê**/: ناو. کەڕاکە؛ لامل؛ بەینی گوێ و بنی کاکیلە ☰ بناگوش

**باگۆ / bago**/: ناو. وەلام ☰ جواب؛ پاسخ

**باگۆرە / bagore**/: ناو. هەرە؛ مشار ☰ ارّە

**باگۆڕ / bagoř**/: ناو. باگۆڕێن؛ هەواگۆڕ ☰ وسیلەی تهویەی هوا

**باگۆڕی / bagořî**/: ناو. باگهۆڕی؛ هەواگۆڕی ☰ تهویە

**باگۆڕێن / bagořên**/: ☜ **باگۆڕ**

**باگەڕ / bageř**/: ناو. باهۆز؛ گێژەڵووکە؛ گەردەلوور؛ گەردەلوول؛ باهۆز ☰ گردباد

**باگەڕێن / bageřên**/: ☜ **بانگلێر**

**باگەف / bagef/**: ☜ باکەف

**باگهۆڕی / bagihoř̂î/**: ☜ باگۆڕی

**باگیر[1] / bagîr/**: ناو. سەرپۆشــی کــون ـــ کــونی قلیاناوی ⊑ درپوش مُشبک قلیان

**باگیر[2]**: ☜ باگر

**باگێجە / bagêce/**: ☜ باگێژە

**باگێژە / bagêje/**: ناو. باگژە؛ باگێجە؛ گێژەڵــووکە؛ گەردەلوول؛ باگەڕ ⊑ گردباد

**باگێیادێ / bagêyadê/**: ناو. مانگی یــادی خــودا؛ مانگی ڕەمەزان ⊑ ماه رمضان

**باڵ[1] / bal/**: ناو. ١. ☜ باڵ[1]ـ١ ٢. ڕەنگــی خــۆڵ ⊑ ١. ☜ باڵ[1]ـ١ ٢. رنگ خاک

◻ **باڵ دان**: ١. لاواندنەوە ٢. پاراستن؛ پــارازتن ⊑ ١. نوازش کردن ٢. حراست کردن

**باڵ[2]**: ئامراز. پــاڵ؛ پالــی؛ کــن؛ لا؛ لــە کــن؛ لــە لا؛ لجەم؛ با؛ لنک ‹دی ب سەعی و جەهد یەکسان بن ل بال وی روز و شەب «جزیری»› ⊑ نزدِ

**بالار / balar/**: ناو. کاریتە ⊑ دیرک

**بالافڕ / balafiř/**: نــاو. باڵفڕ؛ هەلیکوپتەر ⊑ بالگرد؛ هلیکوپتر

**بالافس / balafis/**: ☜ باواقۆرەت

**بالاڤ / balav/**: ناو. بالاو: ١. شــیو؛ کــوڵ؛ شــیو و کوڵ؛ کاری جل شۆردن ٢. کاری خۆ شتن ⊑ ١. رختشویی ٢. آبتنی

◻ **بــالاڤ خۆش**: ســێحەتی ئــاوی گــەرم؛ حــەمام کردنت خۆش ⊑ عافیت

**بالاڤکەر / balavker/**: نــاو. جلشــۆر؛ کولــکەر ⊑ رختشور

**بالاڤگە / balavge/**: ناو. گەرماو ⊑ حمام

**بالاڤیک / balavîk/**: ناو. وردەبرویش ⊑ ریزەبلغور

**بــالان / balan/**: نــاو. ١. بــالان؛ تەڵـــەگورگ ٢. دالانی هەوایی؛ شوێنی دیاری کردنی هاتوچۆی فرۆکە ٣. ڕاڕەو ⊑ ١. تلەی گــرگ ٢. دالان هــوایی ٣. راهرو

**بالبالوکە / balbalûke/**: ناو. تاژیلە ⊑ آخوندک

**بالبالی / balbalî/**: ☜ بالوری

**باڵتان / baltan/**: ئاوەڵناو. ئارام؛ هێدی ⊑ آرام

**باڵتە / balte/**: ناو. ١. ☜ باڵتە ـ٢ ٢. جەنجەڕی گێرە کردن ⊑ ١. ☜ باڵتە ـ٢ ٢. خرمنکوب

**باڵدرێژ / bald(i)rêj/**: ☜ باڵدرێژ

**باڵکێشنامە / balkêşname/**: نــاو. نامەی دادگا بــۆ ئاگاداری ⊑ اخطاریه

**باڵگاش / balgaş/**: ناو. باڵگاشە؛ بانگەشــە؛ ڕیکــلام ⊑ تبلیغات

**باڵگاشە / balgaşe/**: ☜ باڵگاش

**باڵگە / balge/**: ☜ باڵنج ـ١

**باڵگی / balgî/**: ☜ باڵنج ـ١

**باڵگیڤ / balgîv/**: ☜ باڵنج ـ١

**بالمەمی / balmemî/**: ناو. مۆم؛ شەمێ؛ شەم؛ مێــو ⊑ شمع

**بالمیش / balmîş/**: ئاوەڵناو. تــەفر و توونــا؛ بنەبــڕ؛ ئاسەوار براو؛ قڕتێ‌کەوتوو. هەروەها: **بالمیش بوون؛ بالمیش کردن** ⊑ نابود

**باڵنگ / baling/**: ☜ باڵنگ

**بــاڵنگی / balingî/**: ناو. سەرینی ژێر پــێ ⊑ بــالش زیر پا

**بالوفک / balufk/**: نــاو. سەرینی بچووک؛ باڵــنجی چکۆلە ⊑ بالشتک

**بالوویک / baluwîk/**: ☜ بالوکە ـ١

**بــالۆ / balo/**: ئاوەڵکار. بالــێ؛ بــارێ؛ هــەرچۆنێک بێت ⊑ بەهرحال؛ باری

**بالۆرە / balore/**: نــاو. ١. گۆرانی هەڵــدانی کــچ و کوڕ لە چیا کە هەوایەکی تایبــەتی هەیــە ‹دیتــە گوێ لاوکی لاوان/ بالۆرەی بەڵەک‌چاوان «هێمن»›. هەروەها: **بالۆرە کردن؛ بــالۆرە خوێنــدن** ٢. *[مەجاز]* قسەیێ کە کەس لێی تێ‌نەگا ⊑ ١. نوعی ترانــەی

جمعی ٢. مُهملات

**بالۆکه** / baloke/: ☜ **بالوکه ـ١**

**بالۆل** / balol/: ناو. تونگی تاقیگەی کیمیا ▤ بالن آزمایشگاه

**بالۆله** / balole/: ☜ **بابۆڵە**

**بالۆلی** / balolî/: ئاوەڵناو. بـوێر؛ چاونـەترس؛ گوێنەدەر ▤ بی‌باک

**بالۆڵە** / baloɫe/: ☜ **بابۆڵە**

**بالور** / balûr/: ناو. هێلکەدانی مریشک ▤ تخمدان مرغ

**بالوری** / balûrî/: ناو. مۆری؛ مەرمەڕشا؛ هومـایی؛ بالبالی ▤ چلوار

**بالوعه** / balû'e/: ناو. ئـەو گۆنجـەی کـە ئـاو بـۆ ڕەهەند ئەبا ▤ مجرای فاضلاب

**بالوفک** / balûfik/: ☜ **باڵنج ـ١**

**بالوک** / balûk/: ☜ **بالوکه ـ١**

**بالوکـه** / balûke/: نـاو. ١. بـالووک؛ بالۆکـه؛ بالوویک؛ بالیک؛ بایله؛ لک‌ئاسایەکە زۆرتر لە سەر پێستی دەسـت و پـێ هەڵـدەدا و هۆکارەکـەی ویرووسە ٢. تاژیلە؛ تاژیلۆکە؛ ئەسپی پێغەمبـەر؛ تـاژی ئەحمەدڕاوکـەرە؛ جـۆرە کولەیـەکی باریکەلانەی زیتە ▤ ١. زگیل ٢. آخوندک

**باله**[١] / bale/: ناو. ١. خرووکـە؛ ئاولـە؛ پـۆرگ لـە پێسـت ٢. *[سووکەڵە]* سووکەڵـەی برالـە ٣. ☜ **بالێت** ▤ ١. آبله ٢. برادر ٣. ☜ **بالێت**

**باله**[٢]: دەنگەناو. دەنگـی کاژیلـەی سـاوا ▤ صـدای بزغاله

**بالەبال** / balebal/: دەنگـەناو. باڕەبـاڕ ▤ صـدای احشام

**بالەفڕڤان** / balefiřvan/: ناو. فڕۆکەوان؛ فڕۆکەئاژۆ ▤ خلبان

**بالیشت** / balîşt/: ☜ **باڵنج ـ١**

**بالیف** / balîf/: ☜ **باڵنج ـ١**

**بالیفک** / balîfik/: ناو. سەرینی گچکە ▤ بالشتک

**بالیک** / balîk/: ☜ **بالوکه ـ١**

**بالینـه** / balîne/: نـاو. باڵـنجێکی خڕیلانەیـە، دەخرێتە ژێر تەبـەق و مەنجەڵـی بـانی سـەر ▤ بالشتک زیر باری که روی سر حمل می‌شود

**بالێت** / balêt/: نـاو. بالـە؛ سـەمایێکی شـانۆیی ڕۆژاواییە، بۆ دەربڕینی داستانێکی ڕەچـاوکراو ▤ بالت

**باڵ**[١] / baɫ/: ناو. ١. بـال؛ پـەل؛ کـەنگ؛ ئەنـدامی هەڵفڕینی باڵندە ‹من دەڵێم پەپوولەیەک فڕی، بـە باڵی سەوز و سوورەوە «سـوارە»› ٢. باسـک؛ بـاهۆ؛ بازوو ‹لە سەر ماڵم بە لە باڵم! «مەسەل»› ٣. پەلی هەڵـفڕینی فڕۆکـە ٤. هـەرکام لـە لێوارەکـانی تیرئاسـن ٥. لا؛ هەریـەک لـە دوو لای ڕاسـت و چەپ ٦. پەل؛ دەست و پێ ‹چوونە سەریان، چوار باڵیان کردن› ٧. لـە سـەر پەنجـەوە تـا چەناکـە ‹پێوام، هەشت باڵ بوو› ٨. ئامێز؛ بـاوش ▤ ١. بـال پرنده ٢. بازو ٣. بال هواپیما ٤. بال تیـرآهن ٥. طـرف ٦. دست و بال ٧. ذرع ٨. آغوش؛ بغل

⊡ **باڵ بڕین**: *[کینایە]* ١. لە جم و جووڵ خستن ٢. لە دەسـەڵات خسـتن ٣. هـیچ بـە دەسـتەوە نەهێشتن ▤ ١. از حرکت انداختن ٢. دست کوتاه کردن ٣. به فلاکت انداختن

**باڵ بەستن**: قۆڵبەست کردن ▤ کَت بستن

**بـاڵ بـە سـەردا کێشـان/ گـرتن**: ١. خسـتنە ژێـر باندۆر؛ داگیر کـردن ٢. چـاودێری و ئاگـاداری کردن ▤ ١. غصب کردن ٢. مراقبت کردن

**باڵ شکاندن**: *[کینایە]* لە هێز و دەسەڵات خستن؛ بێ‌هێز کردن ▤ از قدرت انداختن

**باڵ فش کردن**: *[کینایە]* خۆ بە شتێک دانان ‹باڵـی فش کردبوو گوایە کەسێکم› ▤ گردن گرفتن

**بـاڵ کـردن**: ١. باڵ دەرهێنان ٢. باسـکۆ کـردن؛ شاباڵی مەل بڕین بۆ نەفڕینی ▤ ١. پـر درآوردن

پرنده ٢. بال پرنده را قیچی کردن

**باڵ گرتن:** ١. ☜ **باڵ گرتنەوە ـ١** ٢. تازە هەڵفڕین ٣. *[مەجاز]* یارمەتی دان ٤. *[مەجاز]* خێرا ڕۆشتن ☱ ١. ☜ **باڵ گرتنەوە ـ١** ٢. پرواز آموختن ٣. دستیاری کردن ۴. سریع رفتن

**باڵ گرتنەوە:** باڵ لێدان: ١. باڵ گرتن؛ فڕین؛ دە حەواوە چوون ٢. پا لە زەوی بڕان؛ زۆر شاد و کەیفخۆش بوون ☱ ١. پرواز کردن ٢. بال درآوردن

**باڵ لێدان:** ☜ **باڵ گرتنەوە**

**لە باڵدا بون:** ☜ **لە باخەڵدا بون**

**لە باڵ یەک بردن:** لێک بلاو کردن؛ لە کەڵک و کار خستن ‹ڕادیۆکەی لە باڵ یەک برد! تازە نابێتەوە ڕادیۆ بۆم› ☱ از کار انداختن

**لە شەقەی باڵ دان:** هەڵفڕین؛ هەڵفڕان ‹کەوتە خۆ دای لە شەقەی باڵ دیسا/ ئاگرێکی لە دەروون داییسا «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☱ بال زدن

**باڵ**[٢]: پێشوشە. ـــ دەست؛ یارمەتیدەر؛ کۆمەکی ‹تەنیاباڵ› ☱ یاور

**باڵ**[٣]: ئامراز. پاڵ؛ پالی؛ کنی؛ پەنای ‹دوو ماڵن دە باڵ یەکدا› ☱ بغلِ؛ کنارِ

**بالا**[١] / bała/: ناو. ١. بالا؛ بان؛ هەنداڤ؛ هەنداو؛ سەر؛ جێگەی چاکتر ‹بالانشین› ٢. بالا؛ بەژن ‹بالابەرز؛ شێوەی ئەو لەولاو ها بەو بالاوە/ بەو بالای شیرین سەرەوالاوە «بێسارانی»› ٣. بالاتەنە؛ بەشی سەرەوی کراس و کەوا ‹کراسەکەم بالاکەی شۆڕە› ☱ ١. صدر؛ بلندی ٢. قد و قامت ٣. قسمت بالای لباس

⊡ **بالا بە بالا گرتن:** خۆ بە قەد یەک گرتن ‹مێژوو هات و بالای خۆی گرت/ بە بالای زامەکانی تۆ/ ... زامەکانت یەک ـــ دوو قولانج درێژتر بوون! ... «شێرکۆ»› ☱ قد به قد گرفتن

**بالا کردن:** ١. درێژ بوون؛ بەرز بوون ٢. گەورە بوون ☱ ١. قد کشیدن ٢. رُشد کردن

**بە بالای کەسێک بڕان:** تەواو لێ کالینەوە ‹ئەم کالایە، هەر بە بالای ئەو دەبڕێ «مەسەل»› ☱ لایق کسی بودن

**بالا**[٢]: ناوەڵناو. سەروو؛ لە سەر ‹خوێندنی بالا؛ دەستی بالای هەیە› ☱ بالا؛ طولا

**بالابان** / bałaban/: ☜ **باڵەبان**

**بالابڵند** / bałabiłind/: ☜ **بالابەرز**

**بالابۆست** / bałabost/: ☜ **باواقۆرەت**

**بالابەرز** / bałaberz/: ناوەڵناو. بەژنبەرز؛ بەژنبلند؛ بلندبالا؛ بالابڵند؛ شاگە؛ شیک؛ قۆلێ؛ کیف؛ درێژن؛ درێژە ‹خشل و خەمل و لەرزانە/ شیاوی بالابەرزانە «هەژار»› ☱ بلندقامت

**بالابەرزە** / bałaberze/: ناو. تلیا ناوی؛ زەڕنەقووتە؛ بەرزەملێ؛ تلیا ناوین؛ گیشتا مێونەن؛ تلیاناوی؛ هەڵمەقووتە؛ قامکە قوچە؛ قامکی قووتێ؛ قامکی قوونێ؛ قامکە قوچە؛ دۆڵەدرێژ؛ قامکی ناوەڕاست؛ سێهەم ئەنگوست لە پەنجەدا ‹ناز دەکا بالابەرزە/ کێ وەک من جوان و تەرزە؟ «هەژار، *پێنج ئەنگوست*»› ☱ انگشت وسطی

**بالابەژن** / bałabejn/: ناو. ئاوێنەی بالاڕوان ☱ آینەی تمامقد

**بالاپچووک** / bałap(i)çûk/: ناوەڵناو. گرد؛ بالاپچووک ☱ کوتاەقد

**بالاپۆش**[١] / bałapoş/: ناو. عەبا؛ جلکی سەر تا پایی ‹بالاپۆشێکی جوانی دەبەر کردووە› ☱ بالاپوش

**بالاپۆش**[٢]: ناوەڵناو. سەر تا پا داپۆش ‹ئەگەر مەیلەکەت فەرامۆشم بێ/ سفیدی کفن بالاپۆشم بێ «فولکلۆر»› ☱ بالاپوش

**بالاتە** / bałate/: ناو. باڵەتە: ١. بلاتە؛ سەرەتای گەیشتنی میوە ٢. گیایەک کە بەرەکەی لە ناو گوڵەکەیدا بێ (وەک: گوڵەبەڕۆژە) ☱ ١. آغاز

رسیدن میوه ٢. گیاهی کـه ثمـرش داخـل گلبـرگش باشد

**بـالاجوان / bałac(i)wan/**: ئاوەڵـناو. شـــووش ☰ خوش قد و قامت

**بالاخانه / bałaxane/**: نـاو. باڵـەخانە: ١. نهـۆمی دووهەم ٢. بەرهێوان؛ وەرهێوانە؛ هەیوانی زۆرتـر سـەرگیراوی پێشـەوەی مـاڵ ‹بالاخانـەی چـەم دیوانەکەی تـۆن/ بانـەناو وە خـاک ئاسـانەکەی تـۆن «مەولەوی»› ☰ ١. طبقەی دوم ٢. رواق

**بالادار / baładar/**: ناو. داری سەرەوەی دار تـەون ☰ چوب بالایی دار قالیبافی

**بـالادەس / bałades/**: ئاوەڵـناو. بالادەســـت: ١. دەسەلاتدار ٢. گەورەتر ☰ ١. بانفوذ ٢. ارشد

**بالادەست / baładest/**: ☜ بالادەس

**بالادەستە / baładeste/**: ئاوەڵناو. نێونجی؛ نە درێـژ نە کورت ☰ متوسط

**بالاڕف / bałaȓif/**: ناو. تاقچە؛ ڕف؛ ڕەفە ☰ تاقچه

**بالاڕوان / bałaȓ(i)wan/**: ناو. ١. بالانما؛ بـالانوێن؛ جامی بالانوێن؛ نەینکا مەزن؛ ئاوێنەی گـەورە ٢. ڕۆچنەی میچ؛ کولانکەی بان ☰ ١. آینەی قدی ٢. روزنەی بام

**بالاشـمە / bałaş(i)me/**: نـاو. بالاشـــــەمە؛ داری دیرەگی سەرتاقەی دیوار کە داری تری بە سەردا ڕایەڵ دەکەن ☰ دیرک تاقچه

**بالاشەمە / bałaşeme/**: ☜ بالاشمه

**بالاعەرعـەر / bała'er'er/**: ئاوەڵـناو. بالابـــەرز ☰ قدبلند

**بالاکورت / bałakurt/**: ئاوەڵناو. کورتەبالا ☰ قدکوتاه

**بالاگەردان / bałagerdan/**: ☜ بەلاگەردان

**بـالان / bałan/**: ناو. فاق؛ تەڵـە؛ تەڵـەی گـورگ و ڕێوی ☰ بالان؛ تلەی گرگ و روباه

**بالاندن / bałandin/**: چاوگ. باڕانـدن ☰ بـع ـ بـع کردن

**بالاندیدە / bałandîde/**: ئاوەڵناو. ئەزموودە؛ خاوەن ئەزموون ‹... لە ناو پسوولێکا نووسیم: من کوردێکی ئاوارەی دنیاگەڕیدە و نیمچـەگورگی بالاندیـدەم! ... «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ باتجربه

**بالانشـین / bałanişîn/**: ئاوەڵـناو. ١. ژوورنشـــین؛ خاوەن جێگای لە بانـەوە ٢. پلەبـەرز؛ بـە پلـە و پایەی بەرزەوە ٣. خاوەن بانترین پلـە و پایـە ☰ ١تا٣. صدرنشین

**بالانما / bałanima/**: ☜ بالاڕوان ـ١

**بالانوێن / bałan(i)wên/**: ☜ بالاڕوان ـ١

**بالانـەوی / bałanewî/**: ئاوەڵـناو. کورتـــەبالا ☰ کوتاەقد

**بالانی / bałanî/**: ناو. ئێستری بـاب ئەسـپی داک ماکەر ☰ استر پدر اسب

**بالاو / baław/**: ☜ بالاف

**بالا و داوێن / bała w dawên/**: ناو. سەر و خـواری کراسی ژنانە ☰ بالاتنه و پایین‌تنەی پیراهن زنانه

**باڵباز / bałbaz/**: ناو. ١. سەرباز؛ چەکداری میری ٢. باڵوێز؛ بریکاری دەوڵەت لە وڵاتێکی‌تردا ☰ ١. سرباز ٢. سفیر

**باڵبەز / bałbez/**: ناو. گوناح؛ تاوان ☰ گناه

**باڵبەس / bałbes/**: ئاوەڵکار. کەت‌بەسە؛ قۆڵبەست ☰ کت‌بسته

**باڵبەسـت / bałbest/**: ئاوەڵـکار. قۆڵبەســـت ☰ کت‌بسته

**باڵبەستە[1] / bałbeste/**: ئاوەڵناو. یەخسیر؛ دەسـت بەسراو ‹دیل و باڵبەستەی دوو زولف و خاڵم/ حەقم بە دەستە تا ڕۆژ بناڵم «فولکلۆر»› ☰ اسیر

**باڵبەستە[2]**: ئاوەڵـکار. قۆڵبەسـتە؛ قۆڵبەسـت‌کـراو ‹گرتیان و باڵبەستە بردیان› ☰ کت‌بسته

**باڵبەڵەکە / bałbełeke/**: نـاو. پەڕبەڵەکە؛ سەقری مێشخۆر؛ قجی؛ قجـی‌بەڵـەک؛ قجـی چـاوڕەش؛ چۆلەکـەگرە؛ مـەلێکی ڕاوکـەری بەرزەفـڕە، بـە

دەنووکی کورت و بەهێز و قاچ و قنگی تیژەوە، لە سەر پنچک و داران هێلانە دەکا و مشک، مارمێلکە و باڵندەی بچووک دەخوا ☰ سنگچشم

**باڵتۆز / baltoz/**: ناو. باڵدز؛ باڵدوز؛ ژنخوشک؛ خوشکی ژن ☰ خواهرزن

**باڵتووسک / baltûsk/**: ناو. دش؛ دوش؛ خوشکی شوو ☰ خواهرشوهر

**باڵتە / balte/**: ناو. ١. بالتە؛ پاڵتاو؛ بالاپۆشی ئەستوور ٢. تەوەر؛ تەور؛ بیور ٣. چەشکە؛ چەژە ☰ ١. پالتو ٢. تبر ٣. طعمەی شکار

**باڵچۆغە / balçoğe/**: ناو. باڵچە؛ دەسکی شیر؛ دەسەی شمشێر ☰ دستەی شمشیر

**باڵچە / balçe/**: ☜ باڵچۆغە

**باڵخەنجەرە / balxencere/**: ناو. کاردەپەلە؛ چەورووکە ☰ بادخورک

**باڵدار[1] / baldar/**: ناو. مەل؛ باڵندە؛ پەرندە ☰ پرندە

**باڵدار[2]**: ناوەلناو. خاوەنباڵ ‹ئەی باز! ئەی مەلی باڵداری خوێنخوار!/ لە ناو مەلاندا مەشهوور بە زۆردار «قانع»› ☰ بالدار

**باڵداسووکە / baldasûke/**: ناو. تەیرەکوێرە ☰ پرندەای است

**باڵدرێژ / bald(i)rêj/**: ناوەلناو. *[کینایە]* باڵدرێژ؛ پشوودرێژ؛ لەسەرخۆ ☰ متین

**باڵدرێژی / bald(i)rêjî/**: ناو. *[کینایە]* پشوودرێژی؛ لەسەرخۆیی ☰ متانت

**باڵدز / baldiz/**: ☜ باڵتۆز

**باڵدوز / balduz/**: ☜ باڵتۆز

**باڵدی / baldî/**: ناو. سەتڵ؛ دۆڵ؛ پەقرەج ☰ سطل

**باڵڕاکێش / balřakêş/**: ناو. چاوساغ؛ قۆڵڕاکێش؛ چاوساغی مرۆی کوێر ☰ عصاکش

**باڵزڕ / balziř/**: ناو. باڵزێڕ؛ مشکگرە؛ سەماکەرە؛ هەڵەکەسەمای گەورە؛ مەلێکی ڕاوکەرە ☰ دلیجە

**باڵزێڕ / balzêř/**: ☜ باڵزڕ

**باڵش / baliş/**: ☜ باڵنج ـ١

**باڵشت / balişt/**: ☜ باڵنج ـ١

**باڵشمە / balişme/**: ناو. چوارچێوەی دەرک و پەنجەرە ☰ چهارچوب در و پنجره

**باڵغ / baliğ/**: ناوەلناو. باڵق؛ بلۆق؛ پێگەیشتوو ☰ بالغ

**باڵغبوو / baliğbû/**: ناوەلناو. گێرانی؛ پێگەیشتوو ☰ بالغ؛ به سن رشد رسیده

**باڵفرنەک / balfirnek/**: ☜ باڵفڕنەك

**باڵفڕ / balfiř/**: ☜ بالافڕ

**باڵفڕنەک / balfiřnek/**: ناو. باڵفرنەک؛ پەپوولە؛ پەڕپەڕۆک ☰ پروانە

**باڵفیکس / balfiks/**: ناو. بارفیکس: ١. لوولەیەکی دوو سەر دابەستراو بۆ خۆ هەڵواسین، بە مەبەستی وەرزش کردن ٢. وەرزشێک کە بەو لوولە دەکرێ ☰ ١و٢. بارفیکس

**باڵق / baliq/**: ☜ باڵغ

**باڵکوڵ / balkul/**: ناو. کوڵەباڵ؛ کوڵەباڵە؛ فەرەنجی بێقۆڵ و تا سەر پشتێند ☰ نیمتنەی نمدی بی‌آستین

**باڵکون / balkun/**: ناو. ١. تارمە؛ هەیوانی بەر پەنجەرە ٢. قاتی سەرەوەی ساڵۆنی سینەما ☰ ١و٢. بالکن

**باڵکۆک / balkok/**: ناو. بەڵگە؛ قەباڵە؛ ئێور؛ تاپۆ ☰ سند

**باڵگاشە / balgaşe/**: ناو. پڕۆپاگەندەی بە درۆ ☰ تبلیغات دروغین

**باڵگاشەچی / balgaşeçî/**: ناو. باسەڕێژ؛ پڕوپاگەندەچی ☰ تبلیغاتچی

**باڵگرەوە / balg(i)rewe/**: ☜ باڵندە

**باڵگە / balge/**: ناو. ژێرسەر؛ سەنیا؛ سەرنگا ☰ بالش

**بـاڵنج / bałinc**/: نـاو. ۱. بالگـە؛ بـالگی؛ بـالگیف؛ بالووفک؛ بالیشت؛ بالیف؛ باڵش؛ باڵشت؛ باڵەشنە؛ باڵین؛ سەنیر؛ سەرنگا؛ سەنیا؛ سەرینی گچکە بـۆ سەر یان دەست خستنە سەر و پاڵ پێـوەدان ۲. ئانیشک ☰ ۱. بالش ۲. آرنج

**باڵنجـەک / bałincek**/: نـاو. نازباڵـــنج؛ بالگـــەی بچووک ☰ نازبالش

**باڵنـدە / bałinde**/: ناو. مـەل؛ پەلـەوەر؛ پەلـەور؛ پەڕندە؛ پەرنـنـە؛ پـەڕۆک؛ باڵـنە؛ باڵـننە؛ فڕنـدە؛ فڕنە؛ فڕا؛ باڵ گرەوە؛ سر؛ توار؛ تـەواڵ؛ تـەرەوڵ؛ هـەرکام لـە گیانـەوەرانی باڵـداری هێلکەکـەر و خوێن گەرم ‹بنە ڕووخـان و سـیپە چـۆڵ و هۆڵـن/ بلاون ڕاوکەر و باڵندە پۆلن «هێمن»› ☰ پرنده

⊡ **باڵنـدەی ڕەشـەبا**: ماسـیگرە ☰ پرسـتو دریـایی کاکایی

**باڵنگ / bałing**/: ناو. بالنگ؛ باروونە؛ میوەیەکە لە تیرەی نارنجان ☰ بالنگ

**باڵننە / bałinne**/: ☜ **باڵندە**

**باڵنە / bałne**/: ☜ **باڵندە**

**باڵوپاڵ / bałûpał**/: ناو. ڕەواج؛ برەو؛ فـراوانی ☰ فراوانی

**باڵ و پەڕ / bał û peř**/: ناو. ۱. پەڕ و پۆ ۲. [کینایە] دەسەلات ☰ ۱. بال و پر ۲. قدرت؛ تکوتا

**بـاڵ و قـۆڵ / bał û qoł**/: نـاو. سـاقۆڵ؛ سـاکول؛ چەپل؛ تەواوی دەست لـە پەنجـەوە تـا شـان ☰ دست و بازو

⊡ **باڵ و قۆڵ شل بـوون**: لە هێز کەوتنی دەست بـە هۆی هەلگرتنی شتی قورسەوە ☰ ناتوان شـدن دست از خستگی

**لە باڵ و قۆڵ کەوتن**: داهێزران و هیلاک بـوونی شان و دەسـت بـە هـۆی کـاری قورسـەوە ☰ ناتوان شدن دست از خستگی

**بـاڵوڵ / bałuł**/: ناو. ۱. [مەجاز] زانا ۲. [پلار] گێلۆکە ☰ ۱. زیرک ۲. هالو

**باڵون / bałun**/: ناو. باڵینەک؛ کیسەی زەلامی پڕ لە گاز یان گەرما کە بە حەوادا دەچێ ☰ بالون

**باڵوێز / bałwêz**/: ناو. سەفیر؛ سـپاردەی مـیری؛ بریکاری دەولەت لە دەولەتێکی تردا ☰ سفیر

**باڵوێزخانە / bałwêzxane**/: ☜ **باڵیۆزخانە**

**باڵۆن / bałon**/: ناو. پفۆک ☰ باڵن

**باڵـە / bałe**/: نـاو. ۱. دەسکێشـی چـەرمین ۲. پێمەرە؛ بێر؛ بێلـی ئاسـن ۳. باڵـی ماسـی ☰ ۱. دستکش چرمی ۲. بیل آهنی ۳. بالەی ماهی

**باڵـەبان / bałeban**/: نـاو. بالابـان: ۱. دەهۆڵـی گـەورە ۲. کـەڕەنا؛ شـەیپووری زۆر گـەورە ۳. ئێستری زەلام و بەهێز ٤. [کینایە] پیـاوی تـەژە و زەبەلاح ٥. ☜ **باشو** ☰ ۱. دهل بـزرگ ۲. بالبـان ۳. استر گنده ۴. مرد لندهور ۵. ☜ **باشو**

**باڵەتە / bałete**/: ☜ **باڵاتە**

**باڵەتەپە / bałetepe**/: نـاو. پەلـەقاژە؛ باڵـەتەپێ؛ باڵ لە زەوی دانی مەل دوای سەر بڕینی ☰ پرپـر زدن مرغ پس از سر بریدن

**باڵەتەپێ / bałetepê**/: ☜ **باڵەتەپە**

**باڵەخانە / bałexane**/: ☜ **باڵاخانە**

⊡ **باڵەخانـەی تـاوسـانی**: کۆشـــکی هـــاوینی ☰ استراحتگاه تابستانی

**باڵەشتە / bałeşte**/: ناو. باڵنجەک ☰ نازبالش

**باڵەشنە / bałeşne**/: ☜ **باڵنج ـ۱**

**باڵەشـۆرە / bałeşoře**/: نـــاو. باڵەشـــۆڕێ؛ نەخۆشییەکە تووشی مریشک و جووجـک دەبـێ باڵیان دادەشۆڕێ ☰ نوعی بیماری مرغ

**باڵەشۆڕێ / bałeşořê**/: ☜ **باڵەشۆڕە**

**باڵەفرتێ / bałefirtê**/: ☜ **باڵەفڕکە**

**باڵەفرکێ / bałefirkê**/: ☜ **باڵەفڕکە**

**باڵەفڕکە / bałefiřke**/: ناو. باڵـەفڕێ؛ باڵـەفرتێ؛ باڵەفرکێ؛ باسکۆ ـ باسکۆ ☰ عمـل پـر زدن پرنـده

هنگام اسارت
**باڵەفڕە / bałef(i)ře/**: ناو. باڵەفڕێ: ١. کاری باڵ لێکدانی جووجەڵە مەل بۆ فێر بوونی فڕین ٢. کاری باڵ بە یەکا دان لە ناچاری ‹... تا نەبمە چنگە خۆڵەمێشێک بە دەم باوە، دەست لە باڵەفڕە و پەلەقاژە هەڵناگرم... «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ ١. تلاش جوجه برای پرواز ٢. عمل بال زدن از ناچاری
**باڵەفڕێ / bałef(i)řê/**: ☜ باڵەفڕە
**باڵەکرە / bałek(i)ře/**: ناو. بێلەکرە؛ بێلەکرێ ☰ عمل بیل بر زمین کشیدن برای جمع کردن آشغال
**باڵەکە / bałeke/**: ناو. شەپیلک؛ کەلەکوچ؛ سەرپیل؛ پارۆی شان؛ دەفەی شان؛ ئێسکی تەخت، تەنک و سێ گۆش لە هەر دوو لای پشتەوە کە سەری باسکی تێدا ڕاگیر دەبێ ☰ استخوان کتف
**باڵەکەو / bałekew/**: ناو. دۆخی لە کەو یان لە داژگیر دانی دەغڵ لە سەر جۆخین بە پێوە ☰ ایستاده، گندم بیختن در خرمن
**باڵەوازە / bałewaze/**: ئاوەڵناو. پەڕەوازە؛ باڵ و پەڕ دەرهاتوو ☰ پرواز آموخته
◘ **باڵەوازە بون**: *[کنایە]* ١. فێری فڕ و فێڵ بوون ٢. دڵداری کردن (بۆ تازەلاو) ☰ ١. مَکر آموختن ٢. عشق و عاشقی کردن در نوجوانی
**باڵەوان / bałewan/**: ☜ باشو
**باڵەوباڵ / bałewbał/**: ئاوەڵکار. دێواندەر؛ ئەم دیو بۆ ئە دیو ‹کولله باڵەوباڵ سمیویەتی› ☰ کامل سوراخ شده
**باڵیدە / bałîde/**: ئاوەڵناو. فڕندە؛ فڕا؛ فڕە؛ پەڕندە؛ خاوەنی لێهاتوویی هەڵفڕین ‹نیسبەت بدرێ حوور و پەری گەر بە لە تۆ چوون/ باڵیدە دەبن تا دەگەنە ئەوجی لە خۆ چوون «مەحوی»› ☰ پرنده
**باڵین / bałîn/**: ناو. ١. باڵگە؛ باڵووفک؛ بالیف؛ باڵش؛ باڵەشتە؛ سەنیر؛ سەرنگا؛ سەنیا؛ سەرینی گچکە بۆ سەر یان دەست خستنە سەر و پاڵ پێوەدان ٢. پێخەف؛ نوێن ‹ئیمشەو من گریام خورووس کەرد ناڵین/ سوب ئەو بێ‌نیشان من زووخ نە باڵین «بێسارانی»› ☰ ١. بالش ٢. بالین
**باڵینە / bałîne/**: ناو. ١. ڕفێدە؛ دۆشەکە چکۆلەیەکە نانکەر نانی پێ پێوە دەدا ٢. ژێرنێر ٣. کورتانی حەماڵی ☰ ١. بالشتک ٢. بالشتک گردن گاو هنگام شخم ٣. پالان حمالی
**باڵینەک / bałînek/**: ☜ باڵون
**باڵیۆز / bałyoz/**: ناو. باڵوێز؛ سەفیر؛ بریکاری دەوڵەتێک لە دەوڵەتێکی تردا ☰ سفیر
**باڵیۆزخانە / bałyozxane/**: ناو. باڵوێزخانە؛ بنکەی بریکاریی دەوڵەتێک لە دەوڵەتێکی تردا ☰ سفارتخانه
**باڵێ[1] / bałê/**: ناو. باڵە دارینەی داوەڵ و بووکەبارانە ☰ بال چوبی مترسک
**باڵێ[2]**: ئاوەڵکار. ١. بارێ؛ هەر چۆنێک بێت ٢. ناشێ؛ لەوە ناچێ ☰ ١. باری ٢. بعید است
**باڵێ[3]**: ئامراز. بەڵێی (بە گاڵتە و سەرسووڕمانەوە)؛ پێم وا نییە ☰ فکر نکنم
**باڵێن / bałên/**: ناو. ١. پشتیوانەی دیوار و کۆڵەکە ٢. دارێکە دەیخەنە پشتی دەرگای داخراو ‹دەرگا و باڵێن داخە و بچۆ!› ☰ ١. کمکی دیوار و ستون ٢. کلون در
**باڵێنەوان / bałênewan/**: ناو. فڕۆکەوان ☰ خلبان
**بام[1] / bam/**: ☜ بادام
**بام[2]**: ئاوەڵکار. با ☰ بله
**بام[3]**: ئامراز. با؛ بهێڵە ☰ بگذار
**بامال / bamał/**: ناو. جێگای بەرز کە با بەفر یان خۆڵەکەی بماڵێ ☰ بُلندای باد روفته
**بامبو / bambû/**: ☜ خەیزەران
**بامجان / bamcan/**: ☜ باینجان
**بامجانەڕەنگی / bamcaneřengî/**: ناو. تەماتە ☰

گوجەفرنگی

**بامرنێ** / bamirnê/: ناو. تاعوون؛ چاوقووڵکە؛ لارەشە؛ قڕان؛ بڵغەتە؛ تاوننە؛ پەتایەکی مەترسیدارە هاوڕێ دەگەڵ یاو، پیس بوونی خوێن و خوێنڕێژی بەربڵاو لە ژێر پێست و شانەگەلی ژێرپێستی و جەرگ و دڵدا ☰ طاعون

**بامڕە** / bamiře/: ناو. بنەبان؛ قوونەبان ☰ کُنجِ بام

**بامشت** / bamişt/: ناو. باگا؛ باگر ☰ بادگیر

**بامیە** / bamye/: ناو. بامێ؛ بامیێ: ١. گیایەکی دەسچنی گەڵاپانی یەکساڵانە، گەڵاکانی لە گەڵای گوڵەهێرۆ دەچێ و گوڵێکی جوانی سپی و زەردی شینباوی دەر دەکا، ناوەڕاستەکەی قاوەیی مەیلەو سوورە ٢. بەری ئەم گیایە کە لە چێشتی دەکەن ٣. جۆرێک شیرینی وەک میوەی گیای بامیە کە لە ئارد، ڕۆن، هێلکە و شەکەر دروستی دەکەن ☰ ١. گیاه بامیه ٢. بامیه ٣. شیرینی بامیه

**بامیێ** / bamyê/: ☜ **بامیە**

**بامێ** / bamê/: ☜ **بامیە**

**بان**[1] / ban/: ناو. ١. باڵا؛ سەر ‹بان زەوی؛ فەرموو دانیشە! بان و خواری نییە› ٢. سەربان؛ بانماڵ ‹لە بانێکا هەزار هەوام/ بەڵام ئەگەر بەم چەشنە بام/ لەم سەنەسارییە چۆن دەمام؟ «دلدار»› ٣. بانە؛ بانوو؛ زەمینی دەشت و بڵند ‹بان هەوەتوو؛ بان لەیلاخ› ٤. بەرزایی؛ بڵندی ‹لەو بانەوە خۆی بەرداوە› ٥. دارێکە لە بنەماڵەی داری مۆرینگا کە تایبەتی وڵاتی هێندوستانە، گەڵاکانی باریک و چەشنی شانەیە، گوڵەکانی سپی و زەرد و سوورە، گوڵ و میوە و گەڵا و ریشە و ڕۆنی میوەکەی بۆ دەرمان دەشێ ‹شوتوربانا! ئەمە پەرژینی باغی ڕەوزەیە یا خۆ/ عەرار و عەرعەر و بانی خیابانی بیابانە؟! «نالی»› ٦. بانگی نوێژ ‹مەلا بانی دا› ٧. گازی؛ بانگ ‹بانی کە با بێ!› ☰ ١. بالا ٢. بام ٣. فلات ٤. بُلندی ٥. درخت بان ۶ اذان ٧. بانگ

▣ **بان چاو**: *[مەجاز]* بان سەر؛ سەرچاو؛ وشەی ئامادەیی نیشاندان بۆ کردنی کارێک ☰ (بە) چشم

**بان سەر**: بان سەر و چاو؛ وشەی ڕێز نان و ئامادەیی نیشاندان بۆ هەرچیک بێژەر بێژێ ‹مام پیرۆت ڕۆژ باش! ئەی بان سەرەکەم/ خێرە، بۆ گرژی؟ لە داخ کەرەکەم! «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ روی سر

**بان یەک**: لە سەر یەکتر: ١. کەڵەکە ٢. پێکەوە ☰ ١. برهم انباشته ٢. روی هم

▣ **بان یەک نان**: کەڵەکە کردن؛ لە سەر یەک دانان ☰ برهم نهادن

**بان ماڵین**: لابردنی بەفری سەربان ☰ برفروبی پشت‌بام

**بان**[2]: ئاوەڵناو. سەر؛ باڵا ‹لە بان هەمووانەوە داینێ› ☰ بالا

**بان**[3]: ئاوەڵکار. لە سەر؛ لە ڕووی ‹ئاغەی ساحیوماڵ وەگەرد خانم/ ئاو پاشینە بان تەپڵ ئامانم! «شامی»› ☰ بالا

**بان**[4]: ئامراز. بانی؛ لە سەری ‹یەسە وە یاری بینای بان سەر/ لە ئیران نەیشتم یەی تەن لە کافەر «شامی»› ☰ رویِ

• **بان**[5]: پاشگر. ئاگادار و خاوەن ‹نیگابان؛ باغەبان› ☰ ـ بان

**بان**[6]: پێرۆ. ← **جێگەوبان؛ دەرکوبان؛ ڕێوبان**

**بانا** / bana/: ناو. بانوما ☰ بادنما

**باناشەو** / banaşew/: ناو. سۆزیشەو؛ سبەیشەوێ ☰ فرداشب

**باناندن** / banandin/: چاوگ. ١. کاری وەک بێچووی بێدایک خستنە بەر دایکێکی تر بۆ ئەوەی وە خۆی گرێ ٢. مێزە کردن؛ نوارین؛ ڕوانین ☰ ١. الفت دادن بچەی حیوان بە حیوان

دیگر ۲. نگریستن

**بانبارگە** / banbarge/: ناو. پاخەسوو؛ پێخەسوو؛ بەربووک؛ ئەو ژنەی دەگەڵ بووک دەچێتە ماڵی زاوا ⯀ ینگەی عروس

**بانبانــک** / banbanik/: نــاو. بانوانـــک؛ ڕزق؛ جانەوەرێکــە لــە تــیرەی سمــۆرە قەڵــەوێکی دەستکورت و قــاچ درێــژە، لــە ڕەوەزە بەردانــدا دەژی ⯀ جانوری از تیرەی سمور

**بانبز** / banbiz/: ناو. ۱. بزنەکێوی ۲. ئاسک؛ مامز ⯀ ۱. بز کوهی ۲. آهو

**بانبەرز** / banberz/: ناو. سەربان؛ بان؛ بانمــاڵ ⯀ پُشتبام

**بانپۆشین** / banpoşîn/: نـاو. خشـڵـێکی ژنانــە لــە سەری دەدەن ⯀ زیوری که زنان بر سر بندند

**بانتلیر** / bant(i)lîr/: ☜ بانگلێر

**بانتلین** / bant(i)lîn/: ☜ بانگلێر

**بانتلێر** / bant(i)lêr/: ☜ بانگلێر

**بانتلێن** / bant(i)lên/: ☜ بانگلێر

**بانجە** / bance/: ناو. تەشابی؛ تەشــە؛ کلاوڕۆچنــە ⯀ روزنەی بام

**بانجیلە** / bancîle/: ☜ بانجێڵە

**بانجێڵـە** / bancêłe/: نـاو. بانجیلــە: ۱. هــەیوانی بێبانی هاوینە بۆ شەو لە سەر نووستن ۲. بانیژە؛ هەر بانێکی نەوی و چکۆلە وەک بانیژەی ئاش ۳. بەرتارمە؛ باڵکۆنی بەر پەنجەرە ٤. کوماج؛ بانیجە ⯀ ۱. تراس ۲. بام کوچک و کــم‌ارتفــاع ۳. بـالکن ۴. خرپشته

**بانچەوک** / bançewik/: ناو. پارچەی ناسکی ســەر لانک ⯀ پارچەی نازک روی گهوارە

**بانخانگ** / banxanig/: ☜ بانخانو

**بانخانو** / banxanû/: ناو. بانخانــگ؛ بــانخــانی؛ سەربان؛ بان؛ بان ماڵ ⯀ پشتبام

**بانخانی** / banxanî/: ☜ بانخانو

**بانخەوەر** / banxewer/: ناو. پارچەی ناسکی ســەر هەویر، بۆوەی تۆزی لێ نەنیشێ ⯀ پارچەی نازکی که روی خمیر می‌کشند

**باند** / band/: ناو. نەواری برینپێچی ⯀ باند

**باندپێچی** / bandpêçî/: نـاو. کــار و ڕەوتی بانــد پێچاندنە دەوری شوێنی بریندابووەدا ⯀ بانداژ

**باندران** / band(i)ran/: چاوگ. واوەیای؛ وەرگیران؛ قەبووڵ کران. ⯀ پذیرفته شدن

**باندڕ** / bandiř/: ناو. داری درێــژی دارەڕا کــە لــە دیوارەکە چۆتە دەرێ ⯀ تیرگ سقفی که از لبــەی بام بیرون زده است

**باندۆر** / bandor/: ناو. ۱. هەرێمی دەســەڵاتداری ۲. ڕەوتی کاردانەوە و شوێن دانان ⯀ ۱. قلمـرو ۲. اثرگذاری

**باندۆڵ** / bandoł/: نـاو. مەندۆڵ؛ فەنەری ســەعات ⯀ پاندول ساعت

**باندوور** / bandûr/: نـاو. نــیر؛ نیلــە؛ نیرێــک کــە ئامووری پێوە دەبەسترێت ⯀ دنبالەی یوغ

**باندەر** / bander/: ناو. بادەوە ⯀ طوفان

**بانسەر** / banser/: نـاو. بانیسەر؛ لاسەرە؛ خــەمڵ و خشڵێکی ژنانە لە ســەری دەدەن ⯀ از زیــورآلات زنانه

**بانشــان** / banşan/: ناو. ۱. چارۆکەی شانپۆش ۲. سەرشان ⯀ ۱. رودوشی ۲. قسمت بالای شانه

**بانق** / banq/: ☜ بانك

**بانقۆ** / banqo/: نـاو. بانک؛ بانگ؛ جۆرێک قوماری پەڕانە ⯀ نوعی بازی با ورق

**بانک** / bank/: ناو. بانق؛ بانگ: ۱. چوانگە؛ شوێنی دان و ستانی پووڵ و پارە ۲. مەکۆ؛ دامەزراوە یان ناوەنــدێک بــۆ هەڵــگرتنی شــتومــەک، تــا لــە پێویستیدا بدرێتەوە بە داواکاران ‹بانکی خــوێن› ⯀ ۱و۲. بانک

**بانکداری** / bankdarî/: ناو. ۱. کار و ڕەوتی بەڕێوە

بردنی بانک ۲. خاوەنیەتی بانک 📖 ۱و۲. بانکداری

**بانکوت / bankut/:** ☜ **بانگلێر**

**بانکە / banke/:** ناو. بەرمیلی چکۆلـە 📖 بشـکەی کوچک

**بانگ / bang/:** ناو. ۱. کاری دەنگ دان بۆ نوێژ ‹وا دەستنوێژ شۆرا گوێمـان لـە بانگـە «پیرەمێـرد»› ۲. گازی؛ قاو ‹فەرمووتە کـە بـانگم کـە، شـەوێ دێمـە کەنارت/ قوربان وەرە شەو ڕۆیی، ئەوا وەعدەیی بانگـە «نالی»› ۳. شیوەن؛ گریانی بەکوڵ؛ هەرای بـەرز ‹شیوەنی من شـیوەنی ئینسـانییە/ بـانگی ئـازادی و گرووی یەکسانییە «هێمن»› ٤. هاوار؛ فریا؛ وەیـل ‹بە ڕشتەی چاوان، بە سرینان گەرم/ بانـگ هـۆردۆم جە سـەر، بێ پـەروا و بـێ شـەرم «بێسـارانی»› ٥. ناوبانگ؛ ناسراوی؛ شـۆرەت ‹مشـوورخۆری گـەلی میللەت، جەنابی موستەفا مەزهەر/ کە بانگی حوسنی خولقی بۆ هـەموو کوردوسـتان ڕۆیـی «بێخـود»› ٦. ☜ **بانك** ۷. ☜ **بانقۆ** 📖 ۱. اذان ۲. ندا؛ کـار صـدا زدن ۳. شیون و زاری ۴. فریاد ۵. آوازه ۶. ☜ **بانـك** ۷. ☜ **بانقۆ**

▣ **بانگی بێوادە:** بانگی بـەدەر لـە کـات و سـاتی خـۆی کـە هێمایەکـە بـۆ ئـەغیار کردنـەوەی خەڵک لە ڕووداوێکی ناخۆش 📖 اذان ناوقت

▣ **بانگ بە گوێدا دان/ خوێندن:** ناو نان؛ ناو لە سەر دانـــانی منداڵـــی موسوڵـــمان لـــە دام و دەستوورێکی تایبەت 📖 نامگذاری نوزاد

**بانگ دان:** بانگی نوێژ گوتن ‹بـۆچی دەنگخۆشـێ نییـە بانـگ بـدات؟/ هـەر لێـرەم دیـوە بانـگ بـە قۆنتەرات! «پیرەمێرد»› 📖 اذان گفتن

**بانگ کردن:** گـازی کـردن؛ گاسـی کـردن؛ بـە دەنگی بەرز هاوار لە کەسێ کـردن ‹کـە بانـگ ئەکا: های ترێ!/ مناڵ وەختە بۆی بمرێ «قانع»› 📖 صدا زدن

**بانگ لێ بەرز بوونەوە:** ☜ **بانگ هەڵدان**

**بانگ هەڵدان:** بانگ لێ بـەرز بوونـەوە؛ شـیوەن کردن بە دەنگی بەرز 📖 گریە سردادن

**بانگ هێشتن:** داوەت کردن؛ بـۆ نـان خـواردن و بەزم و شایی خواستن 📖 دعوت کردن

**بانگاش / bangaş/:** ☜ **بانگەشە ـ۲**

**بانگاڤ[1] / bangav/:** ناو. نێوان ڕۆژاوا و خەوتنان 📖 میان مغرب و عشا

**بانگـاڤ[2]:** ناوەڵـکار. لـە نێـوان ڕۆژاوا و خەوتنانـدا ‹بانگاڤ وەرە مالا مە› 📖 میان مغرب و عشا

**بانگاواز / bangawaz/:** ☜ **بانگەواز**

**بانگدەر / bangder/:** ناو. بـانگوێژ؛ ئـەوەی بـانگی نوێژ ئـەخوێنێ ‹دەک خوایـە بانگـدەر قـۆڕەت لـێ کـەوێ!/ کـە هەڵسـاین بـۆڕەت بـڕابێ شـەوێ «پیرەمێرد»› 📖 مؤذن

**بانگردێن / bangirdên/:** ☜ **بانگلێر**

**بـانگرۆز / bang(i)roz/:** ناو. خلـۆر؛ ئۆتـوز؛ گـلار؛ خلێر؛ تلێر 📖 غلت

**بـانگژا / bang(i)ja/:** ناوەڵـناو. ئـانگژا؛ تـووڕە 📖 عصبانی

▣ **بانگژا بـون:** تووڕە بوون؛ ئانگژا بوون 📖 عصبانی شدن

**بانـگکراو / bangk(i)raw/:** ناوەڵـناو. ڤـەخاندی؛ ڤەخواندی 📖 دعوت شده

**بانـگکەر / bangker/:** ناو. جـاڕچی؛ هاوارکـەر 📖 جارچی

**بانگلان / bang(i)lan/:** ☜ **بانگلێر**

**بانگلۆر / bang(i)lor/:** ☜ **بانگلێر**

**بانگلێر / bang(i)lêr/:** ناو. بانگوێر؛ بانگوێڕ؛ بانگێر؛ بـانگلۆر؛ بانگـەڕ؛ بانگـەڕا؛ بـانگۆش؛ بـانگوش؛ بانگووش؛ بانگردێن؛ باگوردێن؛ بـاگوردان؛ هـاتوڕ؛ بانگلان؛ بارگلان؛ بوونگلوو؛ بانگلێن؛ بـانتلـێن؛ بانتلین؛ بانتلیر؛ بـانتلێـر؛ بـاگردان؛ بـاگردێن؛ باگـــڕێن؛ شـــەولەبان؛ بـــانکوت؛ بانەوســـان؛

مەندەرووونە؛ تەبانە؛ لۆغ؛ گردەڵ؛ پارچە کۆتەرە یا بەردێکی گەورەی گرۆڤەر، سەربانی قوڕیان پێ دەکوتاوە، تکە نەکا ☜ بامغلتان
**بانگلێن / bangilên/**: ☜ **بانگلێر**
**بانگوش / banguş/**: ☜ **بانگەڕ**
**بانگوێر / bang(i)wêr/**: ناو. نگێر؛ شانە؛ شەن‌کێش؛ ئامرازێکی دەم بەرەوخوار وەک چنگاڵێکی گەورە بۆ پاک کردنەوەی زەوینی کشت‌وکاڵ لە زیخ و کەندوکولۆ ☜ شن‌کش
**بانگوێڕ / bangwêř/**: ☜ **بانگلێر**
**بانگوێژ / bangwêj/**: ناو. بانگدەر ☜ مؤذن
**بانگۆش / bangoş/**: ☜ **بانگلێر**
**بانگۆلە / bangole/**: ناو. مێتولکە ☜ نوزاد شپش
**بانگووش / bangûş/**: ☜ **بانگلێر**
**بانگە / bange/**: ناو. ١. منارەی جێی بانگ وتن ٢. مێتولکە؛ سپێی تازە لە ڕشک دەرهاتوو ☜ ١. منارە ٢. نوزاد شپش
**بانگەڕ / bangeř/**: ناو. بانگەڕان؛ بانگێڕ؛ بانگوش: ١. بانگلێر ٢. ئەوەی کاری بانگلێر گێڕانە ☜ ١. بامغلتان ٢. کسی کە بام غلتان را بر بام می گرداند
**بانگەڕا / bangeřa/**: ☜ **بانگلێر**
**بانگەڕان / bangeřan/**: ☜ **بانگەڕ**
**بانگەشە / bangeşe/**: ناو. ١. شات و شووت ٢. بانگاش؛ ڕاگەیاندن؛ ڕیکلام ☜ ١. لاف و گزاف ٢. تبلیغات
**بانگەواز / bangewaz/**: ناو. بانگاواز: ١. هاوار؛ بانگ؛ هەرا بە دەنگی قەو ٢. بانگهێشت؛ قاو ‹دیارە لەمانەدا هەیە بانگەوازێک بۆ گەلی خوداپەرستان «هەژار، *قورئان*»›. هەروەها: **بانگەواز دان؛ بانگەواز کردن** ☜ ١. فریاد ٢. فراخوان
**بانگهێشت / bang(i)hêşt/**: ناو. بانگێشت؛ کاری بانگ‌کردنی خەڵک بۆ بەڕێوە بردنی کارێک بە شێوەی داوخواز. هەروەها: **بانگهێشت کردن** ☜ فراخوان
**بانگهێشتن / banghêştin/**: ناو. دەعوەت؛ بانگێشتن ‹دەوڵەتی باکۆ ڕەسمەن بۆ پازدە ڕۆژ بانگهێشتنی کردبووم «هەژار، *چێشتی مجێور*»› ☜ دعوت
**بانگین / bangîn/**: ناوەڵناو. ژوورگین؛ سەروو ☜ بالایی
**بانگێر / bangêr/**: ☜ **بانگلێر**
**بانگێڕ / bangêř/**: ☜ **بانگەڕ**
**بانگێشت / bangêşt/**: ☜ **بانگهێشت**
**بانگێشتن[١] / bangêştin/**: چاوگ. بانگ کردن؛ داوەت کردن ☜ دعوت کردن
**بانگێشتن[٢]**: ناو. بانگ؛ داوەت ☜ دعوت
**بانما / ban(i)ma/**: ناو. باپێو؛ ئامرازی شاندەری خێرایی با ☜ بادسنج
**بانماڵ / banmał/**: ناو. ١. بەفرماڵ؛ کەسێ بەفر پاڕۆ دەکا ٢. بان؛ سەربان ☜ ١. برف‌روب ٢. پشت‌بام
**باننا‌و / bannaw/**: ☜ **بانەناو**
**بانوان / banwan/**: ناو. ١. سەنگفەرش ٢. کۆڵانەباخ؛ کووچەباخ ☜ ١. سنگفرش ٢. کوچەباغ
**بانوانک / banwanik/**: ☜ **بانبانک**
**بان‌وخوار / ban û x(i)war/**: ناو. *[کینایە]* ساردوگەرم؛ بارودۆخی ژیان ☜ سردوگرم (روزگار)
**بانوما / banuma/**: ☜ **بانبانک**
**بانۆک / banok/**: ناوەڵناو. ١. تایبەتمەندی ئەوەی بێچووی دایک مردوو یان لێ‌نەبان دەخاتەوە بەر دایکێکی‌تر ٢. لێهاتوویی بزن و مەڕ و... کە شیر بە بێچوو دەدەن ☜ ١. دام مادر مردە را بە حیوان دیگر عادت دهندە ٢. ویژگی حیوانی کە بە نوزاد شیر می‌دهد و پذیرای آن می‌باشد
**بانوو / banû/**: ناو. ١. بانە؛ بان؛ دەشتی بەرز ‹... کراسی مەخمەر و تاقەی لە بەردا بەندەن و بانوو «حەقیقی»› ٢. ژنی بەڕێز ٣. کەیوانووی ماڵ ☜

۱. فلات ۲. بانو ۳. کدبانو

**بانووچکه / banûçke/**: نـاو. کۆمـانج؛ کۆمـاج؛ هەورەبان ■ کماج

**بانه / bane/**: ناو. ۱. لەوەڕگەی بەهارانـە بـەر لـە چوون بۆ زۆزان ۲. هاوینەهەوار ۳. بلندایی نێوان دوو دێـراوی ئـاودێری ٤. بـانوو؛ بـانی؛ بـان؛ دەشتایی بلـندتر لـە دەوروبـەری خـۆی ٥. ئـەو هێڵانەی پێش تۆم چاندن جووتێر کێلـگەی پـێ دیاری دەکا تا سنووری تۆ چاندنەکە دیاری بێـت ٦. مەودای نێوان ئەو هێڵانە ٧. تووکەبەر؛ مـووی بەرگەدە ■ ۱. مرتع بهاری قبل از یـیلاق ۲. یـیلاق ۳. بلندی میان دو جـوب ۴. فـلات ۵. خطـوطی کـه برای تعیین حدود تخم پاشی روی زمین می‌کشـند ۶. فاصلەی آن خطوط ۷. موی شرمگاه

**بانەدراو / baned(i)raw/**: ئاوەڵـناو. درژ؛ خـاو ■ تاب‌نخورده

**بانەسەرە / banesere/**: ناو. ۱. زنجـیری بەسـتنی لارەپێچ بە سەرەوە ۲. ئەوندە لە هەر شت کە بـە یەک جار لە بان سەرەوە هەڵـدەگیردرێ ‹چـوار بانەسەرە شێلانەی بوو› ■ ۱. زنجیـر محکـم کـردن دستار زنانه ۲. آن مقدار از هر چیـز کـه بـر روی سـر حمل می‌شود

**بانەشان / baneşan/**: دەنگەناو. هۆدەنـگ؛ وتـەی گازی کرن ■ حرف ندا

**بانەک / banek/**: ناو. خووی؛ خدە ■ خو؛ عادت

**بانەگا / banega/**: نـاو. بەرگـەدە؛ زارگـا؛ زادەگـا؛ هێلین؛ شەرم؛ ڕوڤک؛ هەند؛ هەنـدۆ؛ دلـوو؛ بـەر؛ تاسکە؛ وەرازیز؛ تـەڕاف؛ بەرموسلـدان؛ خەمشـە؛ خەپشە؛ خەپلە؛ ئەو بەشەی لـەش کـە کەوتۆتـە سەر ئێسکی ژێر زگەوە ■ شرمگاه؛ زهار

**بانەمەڕ / banemeř/**: نـاو. ۱. گـوڵان؛ مـانگی دووەمـی سالـی کـوردی ـ هـەتاوی ‹هەوالـی دا شەمالی خاکـەلێوە/ قـەتاری خێلـی بانەمـەڕ بـەڕێوە «حـەقیقی»› ۲. هاوینەهـەوار ■ ۱. اردیبهشـت ۲. ییلاق

**بانەناز / banenaz/**: ناو. بانیژە؛ سەربانی نـەوی و چکۆلە ■ بام کوچک

**بانەناو / banenaw/**: ناو. بانـاو؛ سـواغ؛ سـیواق؛ کاری تێ‌هەڵسوون ‹باڵـەخانەی چـەم دیوانەکـەی تۆن/ بانەناو وە خاک ئاسانەکەی تۆن «مەولەوی»› ■ گل‌اندود بام

▣ **بانەناو کردن**: ناو. هەڕەکاری کردنی بان‌ماڵ ■ گل‌اندود کردن بام

**بانەوبان / banewban/**: نـاو. کـاری بـازدان لـە بانێکەوە بۆ بانێک ■ پرش از بامی به بامی دیگر

**بانەوسان / banewsan/**: چاوگ. ۱. بـە بـاگردێن سەربان کوتـان ۲. کـاتی خـەوتن لـە سـەربانان ‹ڤارانبڕ کەوتەرە، بانەوسان ئاما، ئێتەر بەرەو بانەکـەی بناڤمێ› ■ ۱. بام‌غلتان کردن ۲. موسم خوابیـدن در پشت‌بام

**بانهاڕ / banhař/**: ناو. سەرەوەی ژێرهاڕ ■ سـنگ رویین آسیا

**بانهەڵبان / banhełban/**: ناو. باڵـەخانەی چەنـد قاتی ■ ساختمان بلند

**بانی / banî/**: ناو. بان؛ بانە؛ بانوو؛ دەشتی بـەرز ■ فلات

**بانیجە / banîce/**: ناو. کۆمانج؛ کۆماج؛ هـەورەبان؛ شوێنی سەرکەوتن بۆ سەربان ■ خرپُشته

**بانیژە / banîje/**: نـاو. ۱. ئـەو جێگـەی گـەنمی باراشی لێ ڕۆ دەکەن و لەوێوە دەڕژێتە گـەرووی ئاشەوە ۲. سەربانی نـەوی و چکۆلـە ۳. کۆمـانج؛ هەورەبان؛ شوێنی بە پلیکان پێدا چوونە سـەربان ■ ۱. بامک آسیاب ۲. بام کوچک ۳. خرپُشته

**بانیسەر / banîser/**: ناو. بانسەر؛ لاسەرە؛ خشلێکی ژنانە لە سەری دەدەن ‹سەدای لاو هەی لاو، زڕەی زەڕزەنجـیر/ سسلـە و بانیسـەر بەنـدزرێ و لاگـیر

«مەولەوی»› از زیورآلات زنانە

**بانین / banîn/**: چاوگ. بانینـەوە: ۱. کـاری لـە چەشنی بێچوو خستنە ژێر دایکی نەبان و بێگانە ۲. ناوبژی کردن؛ ناوجی کردن؛ بوونە هۆی ئاشت بوونەوە و ڕێک کەوتن ۱. عـادت دادن دام مـادر مردە بە حیوان دیگر ۲. میانجی شدن؛ آشتی دادن

**بانینەوە / banînewe/**: ☜ **بانین**

**بـاو¹ / baw/**: ناو. ۱. پاڵ؛ کاری تەکان دان ‹باوێک بە جۆلانەوە نێ!› ۲. بـاب؛ بـاوک؛ بـاڤ ۳. بـرەو؛ ڕەواج؛ ڕەونەق؛ ڕمێن ‹کۆیلەتی باوی نەماوە کیژی کوردی خۆشەویست!/ ڕاپەڕە! هەستە لە خەو! ئـاخر چ وەختی خەوتنە؟ «هـێمن»› ٤. هـەل؛ دەرفـەت ‹لە ناو ئەو هەموو ئاوە هەر چاوەیەک باوی هـەنگاوی خۆشە/ بە تەنیا ئەوە شارەزای کۆسپ و کەندالی ڕێیە «سـوارە»› ٥. هێـز و قـەد و بـالا ‹هـەر لـە تەمەنێکدایین، بەلام ئەو لە من باو خۆشترە› ٦. خول و سووڕی توند ‹خولخولەکەم باش بـاو دەخـوا› ٧. هەڕەت؛ جەنگە؛ تاف ‹باوی هەنارە› ۸. مۆد ‹تـازە ئەو لیباسە باوی نەماوە› ۱. هُـل ۲. پـدر ۳. رواج؛ رونق ۴. فرصت ۵. حالت رشد و نمو ۶ چرخش سریع ۷. عنفوان ۸ مُد

▣ **باو بۆ کردن**: گەمە کردنی سەگان لە دوای تێر خواردن بازی کردن سگ‌ها بعد از سیر خوردن

**باو خواردن**: خولانەوە؛ خول خواردن تاب خوردن

**باو سەندن/ سەنن**: ۱. وە برەو کـەوتن؛ وە ڕەواج کەوتن ۲. وە سەر کەوتن بە سەر غەنیمـدا ۳. سووڕ خواردنی بە تەوژم ۱. توسـعە یـافتن ۲. ظفر یافتن ۳. بە سرعت چرخیدن

**باو نان**: پاڵ پێوە نـان ‹دا باوێـک بـەو جۆلانـەوە نێ!› هُل دادن

**باو نەمان**: دەورە بە سەر چوون ‹ئەم کلاوە چیتر باوی نەماوە› از مُد افتادن

**لە باو کەوتن**: سـەردەمی کـارکۆ بـوونی شـتێ تێپەڕ بوون ‹تیر و کەوان لە بـاو کـەوتووە› از مُد افتادن

**باو²**: ناوەلناو. ۱. شیاو؛ ژێهاتی؛ هەژیا؛ هـەژی ‹لـە شارەکەت زەلیلە شـێر/ بـاوی ڕێوییـە «سـوارە»› ۲. لەباو؛ وەگەڕ؛ بەڕمێن؛ بەڕەواج ۱. شایان ۲. رایج

▣ **باو/ بـاوی دڵ**: دڵخواز ‹ئەم ترێیە بـاو دڵـمە› دلخواه

**بـاو/ بـاوی دیـان**: ڕەوای ددان؛ شـیاوی دگـان ‹ماشینی وا گران باو دیانی من نییە› بابِ دندان

**باو/ باوی شان**: ئاسان لە بەر شان ‹درەو باو شان منە› مُناسب

**- باو³**: پاشگر. ئامال؛ واش ‹ڕەشباو؛ شینباو› ـ فام

**باو⁴**: دەنگ. وشەیەکە بـۆ گەمـە دەگـەڵ منـدال دەگوترێ واژەای برای بازی با بچە

**باو⁵**: پێڕۆ. ← **بەندوباو؛ بەیتوباو**

**باوئیرک / baw'îrik/**: ناو. گەوی لە مس یان ئاسن حلقەی مسی یا آهنی

**باوا / bawa/**: ناو. ۱. ☜ **بـاپیر** ۲. بـاب؛ بـاوک ‹باوام لە کشتوکالدا زۆر کارامەیە› ۱. ☜ **باپیر** ۲. پدر

**باواپیارە / bawap(i)yare/**: ☜ **باوەپیارە**

**باواعەمرە / bawa'emre/**: ☜ **باوەعومرە**

**باواقۆرەت / bawaqoret/**: ناو/ ئاوەلناو. بابەقوورەت؛ بـاوەقۆت؛ بـاوەقۆرت؛ بـالافس؛ بالابۆسـت؛ باوەعـەمرە؛ باواعـەمرە؛ باباعـەمرە؛ بسـتەبالا؛ نیوبست؛ مرۆی زۆر کورتەبالا کوتولە

**باواگەورە / bawagewre/**: ناو. باوکی باپیر؛ بـاپیرە گەورە جد پدری

**باوالێ / bawalê/**: ☜ **بابەلێ**

**باوام / bawam/**: ☜ **بادام**

**باوان / bawan/**: نـاو. ۱. ماڵەبابی ژن و بووک ‹جـە دمای یەک ساڵ حەبس بێ ئاوان/ لەیلێ بێوە بی یاواوە باوان «خانای قوبادی»› ۲. بـاب و بـاپیران ‹... مـن

شوێن دینی باوانی خۆم، ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقووب کەفتگم ... «هەژار، *قورئان*» ٣. وشەیەک بۆ بانگ کردن لە ڕووی خۆشەویستییەوە ☰ ١. خانەی پدری زن ٢. اجداد ٣. خطاب محبت‌آمیز

⊡ **باوان شێوان**: *[کینایە]* ١. مردنی گەورەی ماڵ ٢. ئاژاوە کەوتنە ناو بنەماڵەوە ☰ ١. مُردن بزرگ خانوادە ٢. اختلاف در خانوادە افتادن

**هاتنەوە بۆ باوان**: ١. یەکەم هاتنەوەی بووک بۆ ماڵە بابی دوای گوێزانەوە ٢. *[کینایە]* گەڕانەوەی شتی کڕدراو بۆ فرۆشیار (زیاتر بە هۆی خراپی یان ناتەواوییەوە) ☰ ١. اولین بازگشتن عروس بە خانەی پدری ٢. عودت یافتن

**باوانە** / bawane/: ناو. نێرەپاساری؛ نێرە چۆلەکە ☰ گنجشک نر

**باوانی**[1] / bawanî/: ناو. پێتەک؛ پێتک؛ ڕەسەت؛ ڕیسە؛ ڕەهەل؛ ڕەهاڵ؛ جیازی؛ جیاز؛ وەردەک؛ ناوتێلانە؛ شەکێرت؛ کەلوپەل و شتومەکێ کە لەگەڵ بووکدا بۆ ماڵەزاوای دەنێرن ☰ جهاز عروس

**باوانی**[2]: ئاوەڵناو. ١. هی ماڵە باب (کراسە باوانییەکەت زۆر جوانە) ٢. *[کینایە]* میراتی؛ بۆ دەربڕینی ڕق و وەڕەزی لە شتێ دەگوترێ (لابە لە بەر چاوم، کەوشە باوانی! تەواو پای بریندار کردم) ☰ ١. مال جهاز ٢. واژەی ابراز بیزاری از چیزی

**باواینە** / bawayne/: ☜ **بایونە**

**باوباو** / bawbaw/: ناو. باوباوێن؛ جۆرێک گەمەی گەورە دەگەڵ منداڵی ورد ☰ نوعی بازی با کودکان

**باوباوێن** / bawbawên/: ☜ **باوباو**

**باوبرا** / bawb(i)ra/: ☜ **باوکبرا**

**باوبژ** / bawbij/: ناو. ١. تۆز و خۆڵ؛ تۆزێ کە با دەیهێنێ ٢. ☜ **باوپێچ** ☰ ١. گرد و غبار ٢. ☜ **باوپێچ**

**باوپێچ** / bawpêç/: ناو. باوبژ؛ باویزە؛ باپێچەک؛ دۆخی هەڵمسانی ورگ و ژان و پێچ پێداهاتنی بە هۆی بای سکەوە ☰ نفخ شکم

**باوجو** / bawcû/: ئامراز. باوەجوا؛ ئەگەرچی؛ هەرچەندە؛ دەگەڵ ئەوەشڕا (باوجوو بۆتە شەڕمان، بەلام هەر خۆشم ئەوێ) ☰ هرچند

**باوخواردو** / bawx(i)wardû/: ئاوەڵناو. پێچاو ☰ تاب‌خوردە

**باوخۆش** / bawxoş/: ئاوەڵناو. ١. تایبەتمەندی منداڵێ کە فێری گرۆگاڵ و تریقانەوە بووبێ (منداڵەکە باوخۆش بووە، گرۆگاڵیەتی) ٢. خۆشباو؛ هەڵخۆش (... هاودەرسەکانم کە هەموویان لە من باوخۆشتر بوون، پێم‌پێکەنین؛ زۆر بە خۆمدا شکامەوە ... «هێمن») ٣. جحێڵ؛ گەنج؛ لاو ☰ ١. بالندە ٢. خوش‌دست ٣. جوان

**باوڕ** / bawiř/: ناو. باوەڕ؛ بڕوا؛ بیر و بڕوا. هەروەها: **باوڕ (پێ) بوون؛ باوڕ (پێ) کردن** ☰ باور؛ عقیدە

**باوڕەکەی** / bawiřekey/: سارستە. وا دیارە؛ بۆنی ئەوەی لێ دێ (ئەم سارستە بۆ دەربڕینی پێ ناخۆش بوون و بەرهەڵستییەک، لە سەرەتای ڕستەدا دەگوترێ) (باوڕەکەی ئیسە ئیتر جواوم نایتەو!) ☰ بە نظر می‌رسد

**باوش** / bawiş/: ☜ **باوەش**

**باوشک** / bawişk/: ☜ **باوێشک**

**باوشکاندن** / bawişkandin/: چاوگ. باوشکین؛ باوێشک هاتن ☰ خمیازە کشیدن

**باوشکین** / bawişkîn/: ☜ **باوشکاندن**

**باوشکێن** / bawş(i)kên/: ☜ **باوێشک**

**باوشۆر** / bawşor/: ناو. جاجمێ کە وەک تەلیس هەڵیدەدوورن و چۆلەکەی پێدەگرن ☰ دامی از جاجیم کە مانند گونی می‌دوزند و با آن گنجشک می‌گیرند

**باوک** / bawk/: ناو. باب؛ باف؛ باو؛ باوکە ☰ پدر

**باوکانە**[1] / bawkane/: ناو. بالندەی نێر؛ بالداری

نێرینه ≡ پرندەی نر

**باوکانه**[۲]: ئاوەڵناو. باوینی؛ زۆر دلۆڤان ‹ڕێنومایی باوکانه› ≡ پدرانه

**باوکانه**[۲]: ئاوەڵکار. وەکوو باوک ‹باوکانە ڕێنومایی کرد› ≡ پدرانه

**باوکبازی** / bawkbazî/: ناو. شەڕەجنێو بەتایبەت جنێو بە باوک ≡ دشنام‌گویی

**باوکبرا** / bawkb(i)ra/: ناو. بابرا؛ باوبرا؛ برای لە باوکێک و دایک جودا ≡ برادر پدری

**باوکسەگ** / bawkseg/: ناو. سەگباب؛ گەماڵباوک (جنێوێکە) ≡ پدرسگ

**باوکمردوو** / bawkmirdû/: ☜ بابمردوو

**باوکە**[۱] / bawke/: ناو. ۱. باوک ۲. نێرەی باڵدار کاتێ جووچکی هەیە ≡ ۱. پدر ۲. پرندەی نر هنگامی کە جوجە دارد

**باوکە**[۲]: سارستە. ۱. گوتەی بانگ کردنی باب ‹باوکە! منیش بێم؟› ۲. سەرەناوی ڕێزنان لە پیرەپیاوان ‹باوکە! وەرە دانیشە بزانم بۆ هاتووی؟› ≡ ۱. پدرا ۲. خطاب احترام‌آمیز به پیرمردان

**باوکەڕۆ**[۱] / bawkeřo/: سارستە. بابەڕۆ؛ وشەی دەربڕینی ناڕەحەتی لە کاتی مردنی باب یان کارەساتێکی دڵتەزێندا ‹ئای باوکەڕۆ چمان بە سەر هات!› ≡ واژەی ابراز افسوس و حسرت

**باوکەڕۆ**[۲]: دەنگ. *[کینایە]* بابەڕۆ؛ دەنگ و هەرای ناخۆشی کاتی گریان و ڕۆ- ڕۆ ‹بەو دەنگە قوڕەی سەڵای نیوەڕۆ/ هیچ فەرقی نییە لەگەڵ باوکەڕۆ «پیرەمێرد»› ≡ صدای ضجه و شیون

**باوکەلێ** / bawkelê/: ☜ بابەلێ

**باوکیەتی** / bawk(i)yetî/: ☜ باڤیتی

**باوکێتی** / bawkêtî/: ☜ بابییەت

**باوکێنی** / bawkênî/: ☜ باوێتی

**باوگ** / bawig/: ناو. باوک ≡ پدر

**باوگرەوازی** / baw(i)grewazî/: ناو. باوکبازی؛ شەڕەجنێو؛ کاری جوێن بە یەک دان ≡ دشنام‌گویی؛ فحاشی

**باوگوڕی** / bawguřî/: ناو. ڕاوێژکاری؛ ڕاوێژ ≡ مشاوره

**باوگەگەورا** / bawgegewra/: ☜ باپیر

**باول** / bawil/: ناو. باوەڵە؛ جانتا؛ چەمەدان؛ سندووقی لە چەرم و مقەبا بۆ جلک تێنان ≡ چمدان

**باولی** / bawilî/: ناو. باوەڵە؛ یەغدان؛ یەغان؛ سندۆقی گەورەی دەستەداری کەلوپەل ≡ صندوق بزرگ دسته‌دار

**باوڵ** / bawił/: ناو. نەخۆشی چۆکی بێچووی ئاژەڵ ≡ بیماری زانوی برّه و بُزغاله

**باوڵی** / bawłî/: ناو. جانتا؛ جامتا؛ چەمەدان ≡ چمدان

**باوونەریت** / baw û nerît/: ناو. داب و دەستوور؛ ڕێ و شوێن ≡ راه‌ورسم

**باووە** / bawwe/: ☜ بادەوە ـ۱

**باوویان** / baw(i)yan/: ناو. ئارەزوو؛ هومێد ≡ اُمید

**باوە** / bawe/: ناو. ۱. باوکە؛ بابە ۲. کەردوو؛ دێراو ≡ ۱. پدر ۲. کَرت

**باوەپیارە** / bawep(i)yare/: ناو. باواپیارە؛ زڕباب؛ بێگانەی مێردی دایک ≡ ناپدری

**باوەت** / bawet/: ناو. بابەت ≡ بابت

**باوەجوا** / bawec(i)wa/: ☜ باوجوو

**باوەجەڕە** / baweceře/: ☜ باوەخولێ

**باوەخولە** / bawexule/: ☜ باوەخولێ

**باوەخولێ** / bawexulê/: ناو. بابەخولێ؛ باوەخولە؛ باوەجەڕە؛ باوەگێژە؛ مانمانەگێجێ؛ کاری سووڕ خواردن بە دەوری خۆدا ≡ چرخش به دور خود

**باوەخۆن** / bawexon/: ☜ باوەخوون

**باوەخوون** / bawexûn/: ناو. باوەخۆن؛ کاری چوونەوەی بووک بۆ یەکەم جار بۆ ماڵی باوک؛ هاتنەوە بۆ باوان ≡ اولین دیدار عروس از خانەی پدری

**باوەر / bawer/**: ناو. ١. ☜ **باوەڕ** ٢. جۆگەی بەرەخواری ناو دەغڵ ☰ ١. ☜ **باوەڕ** ٢. مسیر سراشیبی آب در کشتزار

**باوەرماڵ / bawermał/**: ناو. کاری پاک کردنەوەی لیتەی ناو جۆگە ☰ لجن‌مالی جوب

**باوەرەک / bawerek/**: ناو. بای بەقەوەت ☰ باد شدید

**باوەرێن¹ / bawerên/**: ناو. باڕن؛ باڕێزە؛ باوێزە؛ باقەرینگ؛ ئەو میوەیە با وەراندوویە ☰ میوەی باد ریختە

**باوەرێن²**: ئاوەڵناو. باڕن؛ باڕێزە؛ باوێزە؛ باقەرینگ؛ بە با وەریو (میوە) ☰ باد ریختە (میوە)

**باوەڕ / baweř/**: ناو. ١. باوڕ؛ بڕوا؛ باوەر؛ دۆخی وەرگرتنی چەمک، دیاردە یان ڕووداوێک لە مێشکدا وەکوو شتێکی ڕاستەقانی ‹بە پەل ـ پەل کردنی سبحەی ئەگەر ببوایە باوەڕیان/ دەبوو قەت بەم حەدە نەبوایە بۆ دنیا پەلەی مەخلووق «مەحوی»› ٢. کەوشەن؛ ناوەرە؛ سنووری نێوان دوو زەوی ☰ ١. باور ٢. مرز بین دو کشتزار

⊡ **باوەڕ (پێ) کردن**: باوەڕ پێ‌هێنان؛ قسە و ئاکاری کەسێ بە ڕاست زانین ☰ باور کردن

**باوەڕ (پێ) هێنان**: ☜ **باوەڕ (پێ) کردن**

**باوەڕ کردن/ کەردەی**: باوەڕ هێنان؛ بە ڕاست زانین ‹مەشێو تۆ لە ڕووی بەندەپەروەری/ هەرچی عەرز کەروون باوەڕ بکەری «پیرەمێرد»› ☰ باور کردن

**باوەڕاندن / baweřandin/**: چاوگ. سەلماندن: ١. هەڵپێچانی کەسێ بۆ وەرگرتنی قسەیەک ٢. لە کەسێکی تردا باوەڕێک خۆش کردن ☰ ١و٢. باوراندن

**باوەڕپێکراو / baweřpêk(i)raw/**: ئاوەڵناو. ئەمین؛ جێ‌باوەڕ ☰ معتمد

**باوەڕدەرمانی / baweřdermanî/**: ناو. دەرمان بە هۆی زیاد کردنی باوەڕ و ئیمان و عەقیدە ☰ باوردرمانی

**باوەڕکری / baweřk(i)rî/**: ☜ **باوەڕمەند**

**باوەڕگران / baweřg(i)ran/**: ئاوەڵناو. دێرباوەڕ؛ سەختباوەڕ ☰ دیرباور

**باوەڕمەند / baweřmend/**: ئاوەڵناو. باوەڕکری؛ بەباوەڕ ☰ باورمند

**باوەڕنامە / baweřname/**: ☜ **بڕوانامە**

**باوەڕی / baweřî/**: ناو. ئیمان؛ ڕابینی؛ ڕکان ☰ اعتقاد

**باوەزیرک / bawezîrik/**: ناو. چزووی دووپشک و هەنگەژاڵە ☰ نیش گزندگان

**باوەژن / bawejin/**: ناو. ژن‌باف؛ زڕدایک؛ هەوێی دایک ☰ نامادری

**باوەژۆ / bawejo/**: ئاوەڵناو. ئاوارە؛ سەرگەردان ☰ آوارە

**باوەسورێ / bawesurê/**: ☜ **بەواسیر**

**باوەسیر / bawesîr/**: ناو. بێوسیری ☰ بواسیر

**باوەش / baweş/**: ناو. باوش؛ ئاوش؛ ئاوەش؛ هاوش؛ واوەش: ١. کۆش؛ کەش؛ ئامێز؛ هامێز؛ هەمێز؛ هامبێز؛ هەمبێز؛ هەمبز؛ همێز؛ همبز؛ هەنگز؛ نێوان سینە و باسک ‹خۆشەویستی گۆشەکەی تەنیایی هەر ئەژنۆکەمە/ بۆیە ڕۆژ و شەو وەها گرتوومەتە نێو باوەشم «هێمن»› ٢. *[مەجاز]* داوێن؛ جێگای گرتنە بەر ‹شار لە باوەشی شاخدا ڕۆژ بە ڕۆژ هەراشتر دەبێ «فەرەیدوون ئەرشەدی»› ☰ ١و٢. آغوش

**باوەشک / baweşk/**: ☜ **باوێشك**

**باوەشی / baweşî/**: ناو. هەڵۆ ☰ عقاب

**باوەشین / baweşîn/**: ☜ **باوەشێن**

**باوەشینک / baweşînik/**: ☜ **باوەشێن¹**

**باوەشێن¹ / baweşên/**: ناو. بارۆشە؛ وادرۆشە؛ باوەشین؛ بای‌وەشن؛ واشەمەک؛ ئامرازێکی لە زەل یان پەلاستیک بۆ با وەدیهێنان بە مەبەستی

خۆ فێنک کردنەوە یان سوخاڵ گەش کردنەوە ‹شنەی بەربەیان دیمەن بە دیمەن/ باوەشێن ئەکا ئەگریجەی چیمەن «شەریف»›. هەروەها: **باوەشێن کردن** ■ بادبزن

**باوەشێن**[2]: ئاوەڵناو. ١. بارۆشەکەر؛ با ڕاوەشێن ‹بەلام دیمانەی تارای باشەکێن/ بۆ کوورەی دەروون بوو بە باوەشێن «گۆران»› ٢. باوەشێنکراو؛ بارۆشەکریاگ؛ ‹زاغەکەی شەو باوەشێنی شاپەڕی/ شەمعەکەی کوژاندەوە وەقتێ فڕی «حاجی قادر»› ■ ١. بادزن ٢. باد زده

**باوەشێنکراو** / baweşênk(i)raw/: ☚ **باوەشێن**[2]

**باوەشێنە** / baweşêne/: ناو. سپەلە؛ سپەرە؛ نێرووک؛ باڕیرە؛ سەفرابەر ■ سرخس

**باوەشێنی** / baweşênî/: ئاوەڵناو. بارۆشەیی؛ لە بیچمی بارۆشە ■ بادبزنی

**باوەعومرە** / bawe'umre/: ئاوەڵناو. باباعەمرە؛ باواعەمرە؛ باوەعەمرە؛ بستەباڵا ■ کوتولە

**باوەعەمرە** / bawe'emre/: ☚ **باواقۆرەت**

**باوەقوش** / bawequş/: ☚ **بایەقوش**

**باوەقۆت** / baweqot/: ☚ **باواقۆرەت**

**باوەقۆرت** / baweqort/: ☚ **باواقۆرەت**

**باوەقۆرەت** / baweqoret/: ئاوەڵناو. گزگل؛ گونجۆڕ؛ باوەعەمرە؛ چلەنۆک ■ کوتولە

**باوەکوو** / bawekû/: ئامراز. ئەگەرچی؛ هەرچەند ■ اگرچە

**باوەگۆ** / bawego/: ئاوەڵناو. قسە دە قسەداکەر؛ لە ناو قسەی یەکیترا هەڵدەر ■ ویژگی کسی کە در میان سخن دیگری بدَوَد

**باوەگێژە** / bawegêje/: ☚ **باوەخولێ**

**باوەلە** / bawele/: ☚ **باولی**

**باوەلی** / bawelî/: ☚ **باویلکە**

**باوەلێ** / bawelê/: ناو. ١. نازناوە بۆ سەیدان ٢. پیری پەککەوتە ‹باوەلێ بایەکی بەسە!› ٣. جۆرێ نەخۆشی ئاژاڵ ٤. ☚ **بابەلێ** ■ ١. لقبی برای سادات ٢. مردِ پیرِ فرتوت ٣. نوعی بیماری احشام ٤. ☚ **بابەلێ**

**باوەڵ** / baweł/: ناو. ١. باوڵ؛ باوەڵی؛ نەخۆشییەکە تووشی ساوای ئاژەڵ دەبێ و ئەژنۆی دەپەنەمێ ٢. بێچووی ئاژەڵێ کە تووشی باوەڵی بووبێت ■ ١. بیماری زانوی برّه و بزغالە ٢. برە و بزغالەی بیمار

**باوەڵە** / bawełe/: ناو. باوڵ؛ جانتا ■ چمدان

**باوەڵی** / bawełî/: ☚ **باوەڵ**

**باوەوە** / bawewe/: ناو. بایەوە؛ بادەوە ■ بوران

**باوی**[1] / bawî/: ☚ **بادام**

**باوی**[2]: ئاوەڵناو. بادار؛ نەخۆش بە دەردی باداری ■ مُبتلا بە رُماتیسم

**باویزە** / bawîze/: ☚ **باوێچ**

**باویژدان** / bawîjdan/: ئاوەڵناو. بەویژدان ■ باوجدان

**باویشە** / bawîşe/: ناو. ١. باڕیزە ٢. دەمەوئێوارە ■ ١. میوەی بادریختە ٢. دیرگاه عصر

**باویلکە** / bawîlke/: ناو. بایلکە؛ باوێلێ؛ باوەلێ؛ بابردەڵە: ١. گیایەکی ئالفی لە تیرەی خەرتەلە، بە گوڵی زەردی ڕۆشن لە سەر لاسکی بەرزەوە ٢. کاسەگوڵی خڕی چەترئاسای میوەی ئەو گیایە کە زۆر سووکە و بە سانایی با هەڵیدەفڕێنێ ‹دەست و پەنجەی وشکهەلاتووم/ شین ئەکەن و وەک باویلکە/ ئەمدەن بە دەم باڕیزەکەی ئەوینتەوە ... «شێرکۆ»› ■ ١و٢. عسلک؛ سپیدە

**باوین**[1] / bawîn/: چاوگ. شوێنێ داگرتن بە گڵ ■ با گِل جایی را پوشاندن

**باوین**[2]: ناو. هێز؛ وزە ■ توان؛ رمق

**باوینی** / bawînî/: ☚ **باوکانە**[2]

**باوێزە** / bawêze/: ناو. باوەڕێن؛ باڕیزە؛ ئەو میوەی کە با لە داری وەراندووە ■ میوەی باد ریختە

**باوێشک** / bawêşk/: ناو. باوشک؛ باوەشک؛

بایەشک؛ بلووشک؛ باوشکێن؛ باوەشی؛ بارێشک؛ بلیشا؛ گرکەش؛ وەلایش؛ دەبانک؛ دەبەنک؛ دەمەکاوەکی؛ دەمەکەوکی؛ دەمەدڕکی؛ قەجەڕە؛ قەدجەڕە؛ ژاژک؛ ئاژاژک؛ ئاژاژکی؛ ئاژاژگی؛ ئاژئاژەکی؛ ئاژئاژە؛ ئاژاشکە؛ ئارۆشک؛ وێژە؛ وێژێ؛ وێژینگ؛ وێژنگ؛ کشکەوڕ؛ کێژکاوڕ؛ نشکێ؛ خەوەشکێ؛ خەوەنشکێ؛ کەشکەلان؛ ماپەرە؛ هەناسەی ناویستەکی کە بە دەمی داچەقاوەوە هەڵدەکێشرێ، پتر لە بەر ماندوویی، خەوالوویی یان بێ‌تاقەتی ‹... باوێشک دەمیان گەزێ پێ دادەچەقاندم. بە وەنەوز و وردەوێژنگانەوە، دە بیرەخەو ڕاچووم ... «هێمن»› ☰ خمیازه

▣ **باوێشک دان**: باوشک دان؛ دەمەدڕکی کردن ☰ خمیازه کشیدن

**باوێلی / bawêlî**: ☜ **باویلکە**

**باوێلێ / bawêlê**: ☜ **باویلکە**

**باوێنی / bawênî**: ناوەڵناو. باوکێنی؛ هی ماڵە باب ☰ پدری

**باهوڕ / bahuř**: ناو. باهۆڕ؛ وڕەبا؛ هۆڕەبا؛ بای زۆر ساردی توند بە مژەوە ☰ باد سرد و تند همراه با مه

**باهۆ / baho**: ناو. ۱. باهوو؛ شان و پیل ‹لە شان و باهۆی خۆم ڕا دی/ هەڵگرم ئاڵای ئازادی «هێمن»› ۲. موور و ئەلوار بۆ کاری نەجاری؛ تەختەی قەوی و درێژ؛ دار و کاریتەی قەوی ☰ ۱. کِتف ۲. چوب الوار

**باهۆبەند / bahobend**: ناو. قۆڵبەن ☰ بازوبند

**باهۆدار / bahodar**: ناوەڵناو. زەلام و بەهێز و تاقەت ☰ تنومند

**باهۆڕ / bahoř**: ☜ **باهوڕ**

**باهۆز / bahoz**: ناو. باهۆس؛ گەردەلوول؛ باگێژە؛ باگەڕ؛ گێژەڵووکە؛ بای بەقەوەتی وا کە سووڕ دەخوا و بەرەو پێش و سەر دەڕوا ☰ گردباد

**باهۆس / bahos**: ☜ **باهۆز**

**باهۆل / bahol**: ناو. ۱. باهۆز؛ گێژەڵووکە ۲. باوەڵە؛ باول؛ جانتا ☰ ۱. گردباد ۲. ساک؛ چمدان

**باهوو[1] / bahû**: ناو. ۱. وارشی دیوار یان خەندەکی دەوری باخچە ۲. لاشێپانەی درگا ۳. ئالوداری دارەڕا ٤. شاهێنی تەرازوو ٥. ئاسۆ؛ ئاسۆگ؛ کەناری ئاسمان ٦. باهۆ؛ شان و پیل ‹ئەلا ئەی نازەنین ئاهوو! بە باهوو/ دڵی سەییادی خۆت هێنایە لەرزە «نالی»› ☰ ۱. خندق ۲. دو طرف عمودی چهارچوبەی در ۳. تیر سقف ۴. شاهین ترازو ۵. افق ۶. کِتف

**باهوو[2]**: ناوەڵناو. قووڵ؛ کووڕ ☰ ژرف

**باهووش / bahûş**: ناوەڵناو. وریا؛ ژیر ‹دنیا زندانە پەی شەخس باهووش/ ئایەم نەبایەد کەمتر بوود لە مووش! «شامی»› ☰ خردمند

**باهەڵکەر / bahełker**: ☜ **باسڕە ـ۲**

**باهەنجیر / bahencîr**: ناو. باتسکە؛ جۆرێ هەنجیری زۆر خراپ ☰ نوعی انجیر نامرغوب

**باهیر / bahîr**: ☜ **بادام**

**باهیڤ / bahîv**: ☜ **بادام**

**باهیڤۆک / bahîvok**: ناو. پەنامی قاچ لە بەر ماندوویی ☰ آماس پا از فرط خستگی

**باهینک / bahînik**: ناو. هینک؛ ڕۆماتیسم ☰ رُماتیسم

**باهێر / bahêr**: ناوەڵناو. ۱. ☜ **بایر** ۲. *[مەجاز]* سەرگەردان؛ سەرلێشێواو ☰ ۱. ☜ **بایر** ۲. سرگردان

**باهێرات / bahêrat**: ☜ **بایر**

**بای / bay**: ناو. ۱. شەمچە؛ شخاتە؛ شقارتە؛ شقاڵتە؛ کرمیت؛ گۆگرد ۲. نرخ؛ قیمەت؛ بایی ☰ ۱. کبریت ۲. نرخ

**بایام / bayam**: ☜ **بادام**

**بایت / bayt**: ناو. چکۆلەترین دەستەی یەکەی زانیاری لە کەمپیوتەردا، بەرامبەر بە هەشت بیت

🇮🇷 بایت

**بایجان** / baycan/: ☜ **باینجان**

**بایدە** / bayde/: ناو. ١. بادیە؛ بایبە؛ بایە؛ کاسەی گەورە ٢. چەرخی؛ دەفری کانزا 🇮🇷 ١. کاسەی بزرگ ٢. کاسەی فلزی

**بایر** / bayir/: ئاوەڵناو. باهێر؛ باهێرات؛ بایەر؛ بوور؛ بوورە؛ بەیار؛ بەیاز؛ بەیر؛ بۆرە؛ بۆون؛ بەون؛ بەوروو؛ بەیتوون؛ کۆدە؛ وشکە؛ تایبەتمەندی زەوینی نەکێڵدراو 🇮🇷 بایر

**بایس** / bayis/: ☜ **باعیس**

**بایست** / bayist/: ☜ **باعیس**

**بایستی** / bayistî/: ☜ **باعیس**

**بایسیکڵ** / baysîkił/: ناو. دووچەرخە؛ ئەسپەئاسنینە 🇮🇷 دوچرخە

**بایلکە** / bayilke/: ناو. باویلکە؛ پشیلەپایزە 🇮🇷 قاصدک

**بایلە** / bayle/: ناو. ١. ☜ **بالوکە ـ١** ٢. پارچە قوماشێکی زۆر تەنک 🇮🇷 ١. ☜ **بالوکە ـ١** ٢. نوعی پارچەی بسیار نازک

**بایم** / bayim/: ☜ **بادام**

**بایمجان** / bayimcan/: ☜ **باینجان**

**بایمنجۆ** / bayinco/: ☜ **باینجان**

**باینجان** / bayincan/: ناو. باجان؛ بامجان؛ بایجان؛ بایمجان؛ باینجۆ؛ بایەمجان؛ باجانڕەشک؛ باینجانەڕەشە؛ تەماتەسیاوێ: ١. بنەگیایەکی یەکسالەی گەڵا برکە ـ برکە و گوڵ بنەوشە ٢. میوەی ئەو گیایە بە پۆستی بنەوشی تۆخ و ئەستووری درێژ یان خڕۆکەوە کە بە کوڵاوی و برژاوی دەخورێ 🇮🇷 ١. بوتەی بادنجان ٢. بادنجان

**باینجانەڕەشە** / bay(i)ncaneřeşe/: ☜ **باینجان**

**باینجانەسوورە** / bay(i)ncanesûre/: ناو. تەماتە 🇮🇷 گوجەفرنگی

**باینجانەفەرەنگی** / bay(i)ncaneferengî/: ناو. تەماتە 🇮🇷 گوجەفرنگی

**باینجانی**[1] / bay(i)ncanî/: ناو. ڕەنگی باینجان؛ بنەوشی تاریک 🇮🇷 رنگِ بادنجانی

**باینجانی**[2]: ئاوەڵناو. بە ڕەنگی باینجان 🇮🇷 بە رنگِ بادنجانی

**باینجۆ** / bayinco/: ☜ **باینجان**

**باینە** / bayine/: ☜ **بوو ـ٢**

**بایوەشن** / bayweşin/: ☜ **باوەشێن**[1]

**بایە** / baye/: ناو. بادی؛ بادیە؛ بایبە؛ کاسەی گەورە 🇮🇷 کاسەی بزرگ

**بایەخ** / bayex/: ناو. گرینگی؛ قەدر؛ بایەق ‹بەو نیازە کە خاوەنی هێزوپێزە، بایەخی بە مووسا نەدا و گوتی: جادووگەرێکە یان لیوە بووە «هەژار، *قورئان*»› 🇮🇷 ارزش؛ قدر

**بایەخدار** / bayexdar/: ئاوەڵناو. بەنرخ و گرینگ 🇮🇷 باارزش

**بایەخداری** / bayexdarî/: ناو. گرنگی؛ گەم؛ گرینگی 🇮🇷 اهمیت

**بایەد** / bayed/: ئاوەڵکار. دەبێ؛ ئەشێ؛ پێویستە ‹حەڤدە ئەفتاوە نریاسە قەتار/ بایەد پەی نەوبەت بلیت بسینی! «شامی»› 🇮🇷 باید

**بایەدەست** / bayedest/: ئاوەڵناو. دەس‌بڵاو؛ هەڵەخەرج 🇮🇷 ولخرج

**بایەدەستی** / bayedestî/: ناو. هەڵەخەرجی 🇮🇷 ولخرجی

**بایەر** / bayer/: ☜ **بایر**

**بایەڕەنگ** / bayereng/: ناو. ئاگرە؛ ئاورە؛ زیپکە و پۆرگ کە لە دەم و چاو دەردێت 🇮🇷 آتش فارسی

**بایەشک** / bayeşk/: ☜ **باوێشك**

**بایەف** / bayef/: ناو. چەقالە بادام؛ فەریکە بادام؛ بایەو 🇮🇷 چغالە بادام

**بایەڤ** / bayev/: ناو. دەوەنێکە زۆرتر بۆ سووتاندن بە کاری دێنن 🇮🇷 بتەای برای افروختن

**بایەق / bayeq/:** ☜ **بایەخ**

**بایەقوش / bayequş/:** ناو. باوەقوش؛ بادەقوش؛ بائەقوش؛ بایەقۆش؛ کوندەبوو؛ کوندەبەبوو ‹کەردنم بە زێد چۆڵ ویرانە/ سازانم چەنی بایەقوش لانە «بێسارانی»› 🇮🇷 بوف‌کور

◘ **بایەقوش لە شوێنێ خوێندن/ هێلانە کردن** ١. کاول بوونی ئەو شوێنە ٢. چۆڵ بوونی ئەو شوێنە 🇮🇷 ١. ویران بودن ٢. خالی بودن

**بایەقۆش / bayeqoş/:** ☜ **بایەقوش**

**بایەکۆش / bayekoş/:** ئاوەڵناو. وەجاخ‌کوێر 🇮🇷 اجاق‌کور

**بایەڵان / bayełan/:** ئاوەڵناو. دەس‌بڵاو؛ هەڵەخەرج 🇮🇷 ولخرج

**بایەم / bayem/:** ☜ **بادام**

**بایەمجان / bayemcan/:** ☜ **باینجان**

**بایەمە / bayeme/:** ناو. لک؛ گرێ؛ لوو 🇮🇷 غُدّە

**بایەمەتاڵە / bayemetałe/:** ☜ **بادامەتاڵە**

**بایەمەکەتانی / bayemeketanî/:** ☜ **بادامەتاڵە**

**بایەو / bayew/:** ناو. بایەف 🇮🇷 چغالە بادام

**بایەوان / bayewan/:** ☜ **بادەوان**

**بایەوە / bayewe/:** ☜ **باوەوە**

**بایهەوا[1] / bayhewa/:** ئاوەڵناو. بادیهەوا؛ لووتبەرز؛ بەفیز ‹چۆتە شار بایهەوا بووە› 🇮🇷 متکبر

**بایهەوا[2]:** ئاوەڵکار. بادیهەوا 🇮🇷 مفت

**بایی[1] / bayî/:** ناو. ١. ☜ **بادام** ٢. نرخ؛ قیمەت ٣. بڕ؛ هەند؛ ئەندازەیەک لە دراو ‹عیراق بایی ٢٢ ملیار دولار چەکی لە ئەمریکا کڕی› 🇮🇷 ١. ☜ **بادام** ٢. نرخ ٣. مبلغ

**بایی[2]:** ئاوەڵناو. ١. بەندیوار یان تایبەت بە با ٢. *[کینایە]* بە فیز و لە خۆگۆڕاو ‹سەد دەورم بدەن ڕووتەی ئاوایی/ بە کلکەلەقێی کەس نابم بایی «پیرەمێرد»› 🇮🇷 ١. بادی ٢. متکبر

**بایی-[3]:** پێشوشە. گۆڕاو؛ تێکچوو ‹باییهەوا› 🇮🇷 متوهم

**-بایی[4]:** پاشوشە. گۆڕاو؛ تێکچوو ‹لەخۆبایی› 🇮🇷 متوهم

**بایید / bayîd/:** ناو. سمت؛ لەگەن؛ تەشت 🇮🇷 لگن

**باییدار / bayîdar/:** ئاوەڵناو. کوک؛ بەقیمەت 🇮🇷 ارزشمند

**باییس / bayîs/:** ☜ **باعیس**

**باییە / bayye/:** ☜ **بایە**

**باییهەوا / bayîhewa/:** ئاوەڵناو. بادیهەوا؛ بەفیز؛ لووتبەرز. هەروەها: **باییهەوایی** 🇮🇷 مُتکبر

**بایێزەر / bayêzar/:** ناو. زەردوویی؛ زەردەیی 🇮🇷 یرقان

**بیڕ / bibiř/:** ئاوەڵناو. ١. تێژ؛ تیژ؛ بڕندە ٢. *[مەجاز]* بلەربەزین؛ بەبڕشت و هێزدار 🇮🇷 ١. تیز؛ بُرنده ٢. بزن‌بهادر

**ببڕای[1] / bibřay/:** ئاوەڵناو. تێژ؛ تیژ 🇮🇷 تیز

**ببڕای[2]:** ئاوەڵکار. بە هیچ جۆر؛ هەرگیز 🇮🇷 هرگز

◘ **ببڕای‌ببڕ:** ☜ **ببڕای - ببڕای**

**ببڕای - ببڕای:** ببڕای‌ببڕ؛ هەرگیزاوهەرگیز؛ قەت - قەت؛ هیچ کات 🇮🇷 ابداً

**ببڵە / bibłe/:** ناو. ساوا؛ کۆرپەساوا؛ بێچووی تازەزاو 🇮🇷 نوزاد

**بت / bit/:** ناو. ١. بوت؛ پت؛ خوالە؛ ژوون؛ مەتەخشەڵ؛ کۆتەڵی مرۆ، گیانەوەر یا گیا کە نیشانەی هێزی ئاسمانی و شیاوی پێدا هەڵگوتن بێت ‹بت ورد ئەکەی، ئەیکەی بە خۆڵ/ بتەوان ئەکوتی وەک دەهۆڵ «گۆران»› ٢. جوانی دڵڕفێن ‹بێخود بە کردەوە و قسە، خاکم بە سەر، وەهام/ هەر وەک دەم و جنێوی بتان نیشم و هەشم «بێخود»› ٣. سۆنە؛ بتئاوی؛ شووش؛ پەلەوەری ئاوبازی کەوی و نەفڕ، لە تیرەی مراوی، بە پا و ملی کورت و خرپنەوە 🇮🇷 ١. بُت ٢. صنم ٣. اُردک

**بتئاوی / bit'awî/:** ناو. بت؛ سۆنە 🇮🇷 اُردک

**بتاقە / b(i)taqe/:** ☜ **بیتاقە**

**بت‌پەرس / bitperis/**: ☜ **بت‌پەرست**

**بت‌پەرست / bitperist/**: ناو. بت‌پەرس؛ کەسێ کە خوای دەسکرد دەپەرستێ ☰ بت‌پرست

**بتخانە / bitxane/**: ناو. شوێنی بتان بۆ پەرستن ‹دەیوت کە بەرەھمەن: مەھی ڕووی ئەم سەنەمەم دی/ گەر بت ئەمە بێ، خزمەتی بتخانە حەرامە «مەحوی»› ☰ بتخانه

**بتر / bitir/**: ئاوەڵناو. ١. پتر؛ زیاتر؛ بێتر؛ پێگەیشتوو و بەگەشە ٢. هەراش؛ هەڵدەر؛ بە خۆداهاتوو ☰ ١. بیشتر ٢. رشید؛ بالنده

**بترپێر / bitirpêr/**: ناو. بەسرپێر ☰ پس‌پريروز

**بترسێن / bitirsên/**: ئاوەڵناو. بم ☰ ترسناک

**بتری / bitrî/**: ☜ **بوتڵ**

**بترژم / bitřijim/**: ناو. ئافەرەم ☰ آفرين

**بتۆ / bito/**: ئاوەڵناو. ١. بن‌بەست ٢. نەزۆک ٣. دۆخی پەردەی کچێنی بەکرۆژە بەرگیراو کە دەبێتە هۆی نەزۆکی ☰ ١. بن‌بست ٢. نازا ٣. حالت پرده‌ی بکارت غضروفی

**بتوی / bitûy/**: ئاوەڵناو. بن‌بەست ☰ بن‌بست

**بتە / b(i)te/**: ناو. لەم؛ پنچک ☰ بوته

**بتەو / b(i)tew/**: ئاوەڵناو. پتەو؛ خۆگر؛ توند و قایم ☰ محکم

**بتەوان / b(i)tewan/**: ئاوەڵناو. بەڕێوەبەری بتخانە ‹شەیتان و بتەوان و بت/ بەرامبەریان کەچ کە ملت! «گۆران»› ☰ خادم بتخانه

**بتەوی / b(i)tewî/**: ناو. قوولایی؛ قوولی؛ کووری ☰ عُمق؛ ژرفا

**بتەوێنەتەوێ / b(i)tewênetewê/**: ئاوەڵکار. بڤێ‌نەڤێ؛ خوایی‌نەخوایی ☰ خواه‌ناخواه

**بتی / b(i)tî/**: ناو. پوور؛ میمک: ١. خوشکی باوک ٢. خوشکی دایک ☰ ١. عمه ٢. خاله

**بچرک / biçirk/**: ☜ **بچڕک**

**بچڕان / biçřan/**: چاوگ. پچڕان؛ پسان؛ قت بوون؛ قەتیان؛ قرتیان ☰ گسستن؛ قطع شدن

**بچڕاندن / biçřandin/**: چاوگ. پچڕاندن؛ قەتاندن؛ پساندن؛ قوت کردن؛ قرتاندن ☰ قطع کردن؛ گُسلاندن

**بچڕک / b(i)çiřk/**: ناو. بچرک؛ ناوساجی؛ زلووبی؛ کولێرە بە ڕۆن؛ نانێکە لە ناو ڕۆنا سووری دەکەنەوە ☰ چلیک؛ نان روغنی

**بچڕیان / biçiřyan/**: چاوگ. پچڕیان؛ پسیان ☰ گسستن؛ پاره شدن

**بچڕین / biç(i)řîn/**: چاوگ. پچڕین؛ پساندن ☰ قطع کردن

**بچکۆک / biçkok/**: ئاوەڵناو. ١. چکۆلە؛ بیچک؛ بچووک؛ گچکە؛ کەم‌قەوارە ٢. ☜ **بچکۆڵانە** ☰ ١. کوچک ٢. ☜ **بچکۆڵانە**

**بچکۆل / biçkol/**: ☜ **بچکۆڵانە**

**بچکۆلانە / biçkolane/**: ☜ **بچکۆڵانە**

**بچکۆلە / biçkole/**: ☜ **بچکۆڵانە**

**بچکۆڵ / biçkoł/**: ☜ **بچکۆڵانە**

**بچکۆڵانە / biçkołane/**: ئاوەڵناو. بچکە؛ بچکۆک؛ بچکۆل؛ بچکۆلە؛ بچکۆلانە؛ بچکۆل؛ بچکەلانە؛ بچکەلە؛ بچۆلە؛ بووچان؛ بووچانە؛ بووچلانە؛ بووچکەلانە؛ بیچکۆلە؛ بیچکۆل؛ بیچکۆلانە؛ بیچکەلە؛ بیچکەلە؛ بیچکەلۆکە؛ بیچکەلانە؛ چکۆلە؛ چکۆلانە؛ چکۆلانە ☰ کوچولو

**بچکۆڵە / biçkołe/**: ☜ **بچکۆڵانە**

**بچکە[1] / biçke/**: ناو. بەچکە؛ بێچوو ☰ بچه

**بچکە[2]**: ☜ **بچکۆڵانە**

**بچکەلانە / biçkelane/**: ☜ **بچکۆڵانە**

**بچکەلە / biçkele/**: ئاوەڵناو. ڕیز؛ وردیلە ☰ ریز؛ خُرد

**بچکەڵە / biçkełe/**: ☜ **بچکۆڵانە**

**بچۆک / b(i)çok/**: ئاوەڵناو. وەردی؛ بیچکەلانە ☰ کوچولو

**بچۆڵە** / b(i)çoɫe/: ☜ **بچکۆلانە**

**بچووچک** / b(i)çûçik/: ☜ **بچووک**

**بچووک** / b(i)çûk/: ئاوەڵناو. بچیک؛ بچکۆک؛ بچووچک؛ چکۆڵە ‹لێوئاڵن، دەم بچووکن/ خوێن‌شیرن، ڕەزاسووکن «هێمن»› ☰ کوچک

**بچووکتان** / b(i)çûktan/: جێناو. ئەزبەنی ☰ جان‌فدا؛ بنده

**بچووکی** / biçûkî/: ناو. ١. دۆخی بچووک بوون ٢. کەم‌قەوارەیی؛ خزمەتکاری و نۆکەری ☰ ١. کوچکی ٢. خدمتگزاری

**بچەر** / b(i)çer/: ئاوەڵناو. چەرندە؛ گیاخۆر ☰ چرنده

**بچەنگانێ** / b(i)çenganê/: ناو. دەستەملان؛ کار و ڕەوتی ئامباز بوون؛ مل دە بەر مل نان ☰ مُعانقه

**بچیک** / b(i)çîk/: ☜ **بچووک**

**بخت** / bixt/: ☜ **بوختیان**

**بختیان** / bixtiyan/: ☜ **بوختیان**

**بخورتی** / b(i)xurtî/: ئاوەڵناو. جەبری ☰ اجباری

**بخوڕ** / b(i)xuř/: ناو. زەنا‌ـ زەنا ☰ سر و صدای زیاد

**بخوس** / b(i)xus/: ئاوەڵناو. زەلام و تەپنۆک ☰ تنەلش

**بخوەر** / b(i)xwer/: ☜ **بخۆر**

**بخۆ** / bixo/: ئاوەڵکار. لە خۆوە؛ هەر بۆ خۆی ☰ خودبخود

**بخۆر** / b(i)xor/: ئاوەڵناو. بخوەر؛ زۆرخۆر؛ فرەخۆر؛ خۆرا ‹ماڵی نەخۆر هی بخۆرە «مەسەل»› ☰ پُرخور

**بخوور** / b(i)xûr/: ناو. بغوورد؛ بوخوورد: ١. سووتەمەنی بۆنخۆشکەر ٢. دەرمانێک کە نەخۆش وەبەر هەڵمەکەی دەدەن ☰ ١و٢. بُخور

**بخووز** / bixûz/: ئاوەڵناو. بغووز؛ خەفۆک؛ تایبەتمەندی گایەک کە لە کاتی جووت کردندا ئەخەوێ ☰ ویژگی گاوی که در اثنای شخم بخوابد

**بخێری** / b(i)xêrî/: ☜ **بوخاری**

**بدبەدە** / bidbede/: ناو. هەوێردە؛ کەڕەواڵە ☰ بلدرچین

**بدوو** / b(i)dû/: ئاوەڵناو. دەم‌پاراو؛ دەماوەر؛ دیواندڕ؛ قەل؛ قسەزان؛ بەگفت‌ولفت؛ زوان‌پاراو؛ لێهاتوو لە قسە کردندا ☰ سخنور

**بدە** / b(i)de/: ناو. ١. داهات؛ بەهرە و داهات؛ دەرامەت ٢. باج؛ پیتاک ☰ ١. درآمد ٢. باج

**بدەر** / b(i)der/: ئاوەڵناو. ١. دەهندە ٢. خۆفرۆش ☰ ١. بخشنده ٢. خودفروش

**بدەو** / b(i)dew/: ئاوەڵناو. خۆشبەز؛ خۆشڕەو؛ چالاک و لێهاتوو لە ڕۆشتندا ‹ئەسپێکی بدەوە› ☰ راهوار

**برا** / b(i)ra/: ناو. برێ؛ ورا: ١. برار؛ نێرینەی هاودایک و باو یان هەر یەک لەوان ‹برا بە برادەر نادرێ «مەسەل»› ٢. وتەیەکی خۆماڵی و دۆستانە لە بری کاکە ‹برا! فیکری چرا، کبریتی فرسەت تا لە دەستایە/ شەوی یەلدا لە پێشە ڕۆژی عومرت وەختە ئاوا بێ «مەحوی»› ٣. برادەر؛ دۆست ‹ئێستە شاییم ئەوا لە دڵ دەگەڕێ/ بە برا کوردەکانی خوار و سەرێ «ئاوات»› ☰ ١و٢. برادر ٣. دوست

▣ **برای تووتە**: ☜ **براتووتە**

**برای تەنی**: برای باوک و دایکی ☰ برادر تنی

**برای حەقودا**: برای حەق‌وداد؛ برای باوک و دایکی ☰ برادر تنی

**برای حەقوداد**: ☜ **برای حەقودا**

**برای دینی**: دۆستی هاوبیروڕا ☰ برادر دینی

**برای شیری**: برای هاڤشیری؛ نێرینەیەک کە لەگەڵ یەکێکی تردا ژنێک شیری دابێتن ☰ برادر رضاعی

**برای ناتەنی**: زڕبرا؛ برای هەر لە باوک یان هەر لە دایکەوە ☰ برادر ناتنی

**برایێ کانوونێ**: ☜ **پایزەبرا**

**براباب** / b(i)rabab/: ناو. باوکبرا؛ نێرینەی

هاوباب و دایک جیا ☰ برادر پدری

**برابەش** / b(i)rabeş/: ناو. ۱. هاوبەش لە ماڵی دنیادا ۲. *[مەجاز]* دۆستی زۆر نزیک ☰ ۱. سهیم در میراث ۲. دوست صمیمی

**براتووتە** / b(i)ratûte/: ناو. برای تووتە؛ قامکی پەنا قامکەچکۆڵە ☰ انگشت بُنصُر

**براتووتەلە** / b(i)ratûtele/: ناو. بابەلیچ؛ قامکی نێوان تووتە و بالابەرزە ☰ بنصر؛ انگشت حلقه

**برادوانە** / b(i)rad(i)wane/: گیاندارێکی نێرینە کە لەگەڵ گیانداری تردا پێکەوە لە دایک بووبێتن ☰ برادر دوقلو

**برادەر** / b(i)rader/: ناو. دەستەبرا؛ دۆستی نێر ☰ دوست؛ رفیق

**برادەری** / b(i)raderî/: ناو. دۆستایەتی؛ هەواڵەتی ☰ دوستی

**براڕۆ** / b(i)ř̌o/: دەنگ. وشەیەکە لە کاتی مردنی برا یان دۆست و هاوڕێدا دەیڵێن ‹لە میحنەتخانەکەی مندا، بە بێ تۆ هەر براڕۆیە/ کە جارێ ئێوە ناپرسن لە من: بۆچی برا ڕۆیی «مەحوی»› ☰ کلمەی عزا و شیون برای برادر یا دوست

**برازا** / b(i)raza/: ناو. برازێ؛ برازاگ؛ فرزەندی برادەر ☰ برادرزاده

**برازازا** / b(i)razaza/: ناو. نەوەی برا ☰ نوەی برادر

**برازاڤا** / b(i)razava/: ☜ **برازاوا**

**برازاگ** / b(i)razag/: ☜ **برازا**

**برازاوا** / b(i)razawa/: ناو. برازاڤا؛ هەواڵی زاوا کە لە کاتی بووک گوێزانەوەدا، پشتێنەکەی ئەو دەیبەستێ ☰ ساقدوش

**برازە** / b(i)raze/: ناو. نوێڵ؛ لۆسە؛ باری؛ باریە؛ مەڵغە؛ لەوازە؛ دەلەم ☰ دیلم؛ اهرم

**برازێ** / b(i)razî/: ☜ **برازا**

**براژتن** / b(i)rajtin/: ☜ **براشتن**

**براژن** / b(i)rajin/: ناو. ژنی برا ☰ زن برادر

**براشتن** / b(i)raştin/: چاوگ. براژتن؛ برژانـدن؛ کەواو کردن؛ بریان کردن؛ بۆدانی دانەوێڵە لە سەر ساج و ... ☰ بو دادن

**براشتی** / b(i)raştî/: ناوەڵناو. برژاو؛ بریان کراو؛ بۆدراو ☰ بوداده

**براکە** / b(i)rake/: دەنگ. وشەی خۆشەویستی بۆ دواندنی هاوتەمەن ☰ حرف نوازش دوستانه

**براکێ** / b(i)rakê/: ناو. برادەر؛ دۆستی زۆر نزیک ☰ دوست صمیمی

**براڵە** / b(i)rale/: ناو. ۱. وشەی خۆشەویستی بۆ دواندنی برادەر ‹دیسان ژیانی دوو براڵە دەقی جارانی گرتەوە «هێمن»› ۲. گیایەکە ☰ ۱. حرف نوازش دوستانه ۲. گیاهی است

**براڵوێ** / birałwê/: ☜ **بلاڵوك**

**براڵو** / b(i)rałû/: ☜ **بلاڵوك**

**براڵوک** / b(i)rałûk/: ☜ **بلاڵوك**

**براڵویی** / b(i)rałûyî/: بلاڵووکە کێویلە؛ گلیەر ☰ آلبالوی کوهی

**برامازگ** / b(i)ramazig/: ناو. بەرێکە لە بەری دار مازوو ☰ پزغند

**براماک** / b(i)ramak/: ناو. دایکبرا؛ برای هەر لە دایک ☰ برادر مادری

**بـران** / b(i)ran/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //بـرای؛ دەبرێی؛ ببرێ// ۱. بردران؛ بریان ‹برا نێفەک، دڕا سەرپێچ و دەسماڵ/ برا کیژ و درا کوڕ پاڵەپەستۆ «هێمن»› ۲. دانان؛ دۆڕاندن ☰ ۱. بـرده شـدن ۲. باختن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: براو/ چاوگی نەرێنی: نەبران

**براندۆخ**[1] / b(i)randox/: ☜ **براندۆك**

**براندۆخ**[2]: ناوەڵناو. کەللەڕەق؛ خیشەسەر ‹مرۆیەکا گەلەک براندۆخە› ☰ خیرەسر

**براندۆک** / b(i)randok/: ناو. براندۆخ؛ درۆینەوان ☰ دروگر

**برانکارد** / b(i)rankard/: ناو. دەستەبەرە؛ تەختی گواستنەوەی نەخۆش یان بریندار 📖 بُرانکارد

**• براو** / b(i)raw-/: پاشەوشە. داناو؛ دۆڕاو ‹چاکەم بە دەست خراپەوە هەر زاک و زووکییە/ چ بکەم پەرۆشی مالی بە تالان‌براومە «بێخود»› 📖 باختە

**براوە** / b(i)rawe/: ناوەلناو. *[مەلەی باو]* سەرکەوتوو؛ بەرەندەی کێبەرکێ ‹یانەی هەولێر براوەی کێبەرکێ بوو› 📖 برندە

**برایانە**[1] / b(i)rayane/: ناوەلناو. *[مەجاز]* زۆر نزیک ‹دۆسایەتی برایانە› 📖 برادرانە

**برایانە**[2]: ناوەلکار. وەک برا ‹بەسیەتی دووبەرەکی و ملهوڕی و لاساری/ تا برایانە هەموو پێکەوە نەدوێن، دەگریم «هێمن»› 📖 برادروار

**برایەتی** / b(i)rayetî/: ناو. ١. چۆنیەتی برا بوون ‹بە چپەی ورد، ئەم داری دڕکەمان ناو نا: برایەتی عارەب و کورد! «گۆران»› ٢. *[مەجاز]* خۆشەویستی و جووڵانەوەی برایانە 📖 ١و٢. برادری

**برایی** / b(i)rayî/: ناو. برایەتی ‹برامان برایی، کیسەمان جیایی› 📖 برادری

**بربەنگ** / birbeng/: ☜ **بڕبەند**

**برج** / birc/: ناو. بورج: ١. مزلگەی ڕۆژ لە ئاسمان ٢. مانگی سال ٣. قۆنگرەی قوتی قەلا ٤. سیپە؛ جاسووسە؛ دەرزیلەی نیشانە گرتن لە سەر تفەنگ 📖 ١. برج فلکی ٢. ماهِ سال ٣. برجِ قلعە ۴. مگسک تفنگ

⊡ **برجی پیرێژن:** دووهەمین حەوتەی ڕەشەمە کە زۆر ساردە 📖 سرمای پیرزن

**برجلانەکی** / birc(i)łanekî/: ناو. جۆلانێ 📖 تاب

**برچ** / birç/: ☜ **بلچ**

**برچەبرچ** / birçebirç/: دەنگەناو. دەنگی قولتە قولتی ئاو 📖 صدای غلیان آب؛ غل ـ غل

**برچی** / birçî/: ☜ **برسی**

**برچیتی** / birçîtî/: ☜ **برسیەتی**

**برچینی** / birçînî/: ☜ **برسیەتی**

**برچێتی** / birçêtî/: ☜ **برسیەتی**

**برچێنی** / birçênî/: ☜ **برسیەتی**

**برد** / bird/: پێرِۆ. ← **دەستوبرد**

**بردران** / bird(i)ran/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //بردرای؛ دەبردرێی؛ ببردرێ// ١. بران ٢. دانان 📖 ١. بردە شدن ٢. باختن

■ ناوەلناوی بەرکاری: بردراو/ چاوگی نەرێنی: نەبردران

**بردن** / birdin/: چاوگ. تێنەپەڕ. //بردت؛ دەبەی؛ ببە// ١. برن؛ هەلگرتن و گواستنەوەی شتێک؛ بەرانبەری «هێنان» ٢. دزین ‹عەقل و خیرەدی بردووم، نەشئەی قەدەحی چاوت/ پێوەندی هەوای کردووم، تای زولفی پەرێشانت «بێخود»› ٣. پێچوون؛ خایاندن ‹مال کردنەوە سالێکی برد› ٤. تێچوون؛ خەرج هەلگرتن ‹کاری وا پارەی زۆر دەبا› ٥. تێراکردن ‹پێدا بردن› ٦. هەلبژاردن ‹تۆ کامی دەبەی؟› ٧. ئازرانـدن؛ ئەزیەت کردن ‹سەرمتان برد› 📖 ١. بردن ٢. دزدیدن ٣. زمان بردن ۴. هزینە برداشتن ۵. فرو کردن ۶. برگُزیدن ۷. آزُردن

■ ناوەلناوی بەرکاری: بردراو/ چاوگی نەرێنی: نەبردن

⊡ **بردنە بەست:** *[کینایە]* تەنگ پێ‌هەلێنان؛ تەنگ پێ‌هەلچنین؛ تەنگەتاو کردن 📖 در تنگنا قرار دادن

**بردنە ڕێوە:** بەرێوە بردن؛ وە ڕێ خستن ‹کارەکەیان باش بردە ڕێوە› 📖 پیش بُردن

**بردنە سەر:** ١. ئەنجامدان؛ بە ئاکام گەیاندن ‹شەرتی وەفای بردە سەر› ٢. گوزەراندن؛ ڕابواردن ‹گول حەفتە ناباتە سەرێ/ سیس دەبێت و هەلدەوەرێ «هێمن»› ٣. *[مەجاز]* گەورە کردن؛ کەسایەتی پێ دان ‹ئەوەندەی تاریف کرد و بردیە سەر گەیاندییە ئاسمان!› ٤. شتێ بردنە بان ‹قالییەکەم بردە سەر› 📖 ١. بە انجام

رسانیدن ٢. گذراندن ٣. به اعتبار کسی افزودن ۴. بالا بردن

**بردنە کان** کردنە کار؛ بۆ دروست کردنی شتێک یان بەڕێوە بردنی کارێک بەهرە لێ بردن ‹ئاسنی زۆری بردۆتە کار› ☰ به کار بُردن

**بردنەوە / bird(i)newe/**: چاوگ. تێپەڕ. //بردتەوە؛ دەبەیەوە؛ ببە(رە)وە// برنەڤە؛ برنەوە: ١. قازانج کردن ٢. سەرکەوتن لە کێبەرکێ یان کایەدا ٣. گەڕاندنەوە بۆ شوێنی پێشوو ☰ ١. سود بردن ٢. پیروز شدن ٣. بازگرداندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: براوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەبردنەوە

**- بردو / birdû-/**: پاشەوشە. ـــ بردە؛ تووشیاری وەبەر کەوتن ‹سەرمابردوو؛ خەوبردوو› ☰ دُچار

**• بردە / birde/**: ☜ **بردو**

**برزە / birze/**: ☜ **بزر**

**• برژ/ birj-/**: پاشەوشە. برژاو ‹نیوەبرژ› ☰ برشته

**برژان**[1] **/ birjan/**: چاوگ. تێپەڕ. //برژای؛ دەبرژی؛ ببرژە// برشیان: ١. برشتە بوون ‹لە ناو فڕنی دەروونا وەک سەموون بۆچی نەبرژێ دڵ؟/ لە کوورەی سینەدا تا کەی نەبێ جەرگیش بە بوریانی؟ «مەحوی»› ٢. *[مەجاز]* قاڵ بوون لە کارێک یان بابەتێکدا ☰ ١. برشته شدن ٢. غرق کار یا چیزی شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: برژاو/ چاوگی نەرێنی: نەبرژان

**برژان**[2]: ☜ **برژانگ**

**برژاندن / birjandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //برژاندت؛ دەبرژێنی؛ ببرژێنە// برژانن؛ براشتن؛ براژتن: ١. بریان کردن ‹کاڵ و کولیویان گشت لێ فڕاندین/ گۆشتیان برژاندین، ئێسکیان کڕاندین «هەژار، بۆ کوردستان»› ٢. بۆ دان ☰ ١. برشته کردن ٢. بو دادن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەبرژاندن

**برژاندنەوە / birjand(i)newe/**: چاوگ. تێپەڕ. //برژاندتەوە؛ دەبرژێنیەوە؛ ببرژێنەوە// ١. خوێن ڕاگرتنی برین بە دەرمان ٢. دیسان برژاندن ☰ ١. خون بست کردن زخم با دارو ٢. دوباره برشته کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەبرژاندنەوە

**برژانگ / birjang/**: ناو. برژان؛ برژۆڵ؛ برژاو؛ برژنگ؛ بژانگ؛ بژۆڵ؛ بژۆلک؛ بژوولک؛ بژۆن؛ بژێلک؛ بشکۆڵ؛ مژۆڵ؛ مژەو؛ مجەو؛ مرژنگ؛ میرزینگ؛ مووی کورت و زبری سەر لێواری پێڵوو ‹برژانگ چاوەکەت لە دڵم تیری کارییە/ جەرگم هەمیشە جۆگەلەکەی خوێنی جارییە «حەق‌شناس»› ☰ مُژه

**برژانن / birjanin/**: ☜ **برژاندن**

**برژانەوە / birjanewe/**: چاوگ. تێپەڕ. //برژایەوە؛ دەبرژێیەوە؛ ببرژەوە// برژینەوە: ١. سووزیانەوەی زام؛ ژان کردنی برین ٢. وێستانی خوێن بە هۆی دەرمان ٣. دیسان برژاندن ☰ ١. سوختن زخم ٢. بند آوردن خون با دارو ٣. دوباره برشته شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: برژاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەبرژانەوە

**برژاو**[1] **/ birjaw/**: ☜ **برژانگ**

**برژاو**[2]: ئاوەڵناو. ١. برژیاو؛ برژیو؛ برژیاگ؛ براشتی؛ بریان ‹نانی برژاو› ٢. *[مەجاز]* شارەزا و لێهاتوو لە کارێکدا ☰ ١. برشته ٢. خُبره

**برژنگ / birjing/**: ☜ **برژانگ**

**برژۆڵ / birjoł/**: ناو. ١. ☜ **برژانگ** ٢. پرزە و ڕیشاڵی کووتاڵ ٣. داسووکەی گوڵی دەغڵ ☰ ١. ☜ **برژانگ** ٢. پُرز قماش ٣. اخگل؛ داسه

**برژی / birjî/**: ئاوەڵناو. برژاو ☰ برشته

**برژیاگ / birjyag/**: ئاوەڵناو. برژاو ☰ برشته

**برژیان / birjyan/**: چاوگ. برژان ☰ برشته شدن

**برژیانەوە / birjyanewe/**: ☜ **برژانەوە**

**برژیاو / birjyaw/**: ☜ **برژاو**[2]**ـ١**

**برژین** / birjîn/: چاوگ. برژان ☰ برشتن

**برژینەوە** / birjînewe/: ☜ برژانەوە

**برژیو** / birjîw/: ☜ برژاو[۲]-۱

**برژیندران** / birjêndran/: چاوگ. برژینران؛ برژیان؛ برژان ☰ برشته شدن

**برژینران** / birjênran/: ☜ برژیندران

**برس** / birs/: ناو. برسییەتی؛ برچێتی ‹تێک هەڵشێواوە بە بای باڵی دێو/ هەموو لە برسا ڕوو دەکەنە کێو «پیرەمێرد»› ☰ گرسنە

⊡ **برس چوونە بەس**: هیچ پێ نەخوران؛ لە خواردن وەڕەز بوون ☰ اشتها کور شدن

**لە برسان مردن**: بە هۆی برسییەتی زۆر گیان دەرچوون ‹بێ منەت ڕزقێکە غەم، بمرم لە برسان، ئەو دەخۆم/ تەفرە ناخۆم و تەلەب ناکەم لە دنیا قووتی ڕۆح «مەحوی»› ☰ در تنگنا قرار دادن

**برساق**[۱] / birsaq/: ناو. جۆرێ کولێرەی ناسک و شیرین لە ئارد، شیر، شەکر و ڕۆن ☰ برساق

**برساق**[۲]: ئاوەڵناو. ڕوودار؛ بێشەرم ‹فرە ئایەمێک برساقە› ☰ گستاخ؛ بی‌شرم

**برساقی** / birsaqî/: ناو. ڕووداری؛ گوستاخی ☰ گستاخی

**برسکە** / b(i)riske/: ☜ بروسکە

**برسی** / birsî/: ئاوەڵناو. برچی؛ نێز؛ ئاورا ‹گەر دەپرسی من لەبەرچی کەم دەخۆم/ من بە برسی قەت مەزانە، غەم دەخۆم «نالی»› ☰ گرسنە

**برسیاتی** / birs(i)yatî/: ☜ برسییەتی

**برسیایەتی** / birs(i)yayetî/: ☜ برسییەتی

**برسیەتی** / birs(i)yetî/: ☜ برسییەتی

**برسییەتی** / birsîyetî/: ناو. برسیایەتی؛ برسیەتی؛ برسێتی؛ نێزی؛ برسیاتی؛ برچیتی؛ برچێتی؛ برچینی؛ برچێنی؛ ئاورایێ؛ بارودۆخی ورگ بەتاڵ بوون ‹دەڵێن برسییەتی دەوری ماڵی سنعاتکار دەدا، بەڵام ناوێرێ بچێتە ژوورەوە «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ گرسنگی

**برسێتی** / birsêtî/: ☜ برسییەتی

**برش**[۱] / birş/: ناو. ۱. کەڕوو؛ کەڕەکیفە؛ جۆرێک کارگ و لاکوتی یەکجار ورد کە دەبنە هۆی تام و بۆن گۆڕانی خواردەمەنی ‹ڕاینەبویرم منیش بەکەشک و بەڕوو/ نیعمەتی خوایە چێش لە برش و کەڕوو «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ۲. *[مەجاز]* هێز و هەناسە ☰ ۱. کپک ۲. نا؛ رمق

⊡ **برش هەڵاتن**: هێز و هەناسە بڕان ‹یەک چەند گەرمە! برشم هەڵات!› ☰ از نا افتادن

**برش هەڵێنان**: ☜ برش هێنان

**برش هێنان**: کەڕوو هێنان؛ برش هەڵێنان؛ کەڕەکیفە دان ☰ کَپَک زدن

**برش**[۲]: ئاوەڵناو. لێڵ و خۆڵەمێشی ‹چارەم ڕەشە، دڵ‌بەژان و تاسەم/ برش و ڕەشی دووکەڵی هەناسەم «هەژار، *مەم و زین*»› ☰ خاکستری

**برش**[۳]: پێرۆ. ← **ڕەش‌وبرش**

**برشاوی** / birşawî/: ئاوەڵناو. برش‌هەڵێناو ☰ کپک‌زدە

**برشتە** / b(i)rişte/: ئاوەڵناو. برشتی؛ برژاو ☰ برشتە

**برشتی** / b(i)riştî/: ☜ برشتە

**برشو** / birşû/: ناو. کەڕوو؛ کەڕەکیفە؛ برش ☰ کپک

**برش‌هەڵێناو** / birşhełênaw/: ☜ برشاوی

**برش‌هێناو** / birşhênaw/: ئاوەڵناو. برش‌هەڵێناو؛ مژوو؛ کوفکی؛ کۆنی برشاوی ☰ کپک‌زدە

**برشیان** / birşyan/: ☜ برژان

**برغو** / birğû/: ناو. برغی؛ بورغوو؛ بورغی؛ بزماری بە پێچ؛ ئامرازی کون کردنی پێچدار ☰ بُرغو

**برغی** / birğî/: ☜ برغو

**برفات** / birfat/: ناو. دەرفەت؛ هەل ☰ فرصت

**برقاندن** / birqandin/: چاوگ. بریقاندن؛ ترووسکاندن ☰ تاباندن

**برقۆک / birqok/**: ئاوەڵناو. بریکەدار؛ بە ترووسکە؛ بریقەدار ⚑ براق

**برقە / birqe/**: ناو. بریقە؛ ترووسکە ⚑ درخشش

**برقەبرق / birqebirq/**: ☜ **بریکە**

**برقەنـدەرە / birqendere/**: ناو. تـۆڕک؛ تـۆڕی؛ چەقەڵ ⚑ شغال

**برقین / birqîn/**: چاوگ. ترووسکان؛ تیشکدانەوە ⚑ درخشیدن

**برک[1] / birk/**: ناو. ١. خالیگە؛ کەلەکە ٢. دەرد و ژانی کەلەکە ‹ئەو کەسەی نەیچێشتووە دەردی ژیان/ ئەو کەسەی نەیدیوە ئێش و برک و ژان «هێمن»› ٣. ئەستێل؛ ئەستێر؛ هەسێل ⚑ ١. تهیگاه ٢. درد تهیگاه ٣. برکه

**برک[2]**: ↓

⊡ **برک دان**: هاویشتن؛ فڕێ دان ⚑ پرتاب کردن؛ انداختن

**برکدراو / birkdraw/**: ئاوەڵناو. فڕێدراو ⚑ پرت شده

**برگ / birg/**: ☜ **باتر**

**برمە[1] / birme/**: ناو. جۆرێ شیرینییە گوێز یا پستەی تێ دەکرێ ⚑ نوعی شیرینی

**برمە[2]**: دەنگەناو. نووزە و ناڵەی تادار ‹حەپس و عەزلی من لە سەر شانم ئەگەرچی برمەیە/ چونکە ئەمری ئێوە بوو پاڵتاوی شالی ترمەیە «بێخود»› ⚑ آه و نالەی تبدار

**برمەبرم / birme birm/**: دەنگەناو. بۆڵەبۆڵ؛ پرتە و بۆڵە؛ کاری قسە لە ناو دەمدا کردن کە کەسی تێنەگا ‹کاورا هەر برمەبرمیەتی نازانم دەڕێ چیی؟› ⚑ غرولند

⊡ **برمەبرم کردن**: بۆڵاندن؛ بۆڵەبۆڵ کردن ⚑ غرولند کردن

**برن / birin/**: چاوگ. بردن ⚑ بردن

**برنج / b(i)rinc/**: ناو. برینج؛ برێنج: ١. برنجە؛ زەرد؛ کانزای تێکەڵاوی مس و ڕۆح ٢. گرینج؛ چەشنێکی دانەوێڵە کە بە کوڵاوی دەخورێ (دەبێتە پلاو یان کەتە) ٣. پلاو؛ کەتە؛ خۆراکی لە برنج دروستکراو ⚑ ١. آلیاژ برنج ٢. دانەی برنج خوراکی ٣. پلو

**برنجاڕ / b(i)rincař/**: ناو. برنجەجاڕ؛ مەرەزە؛ قەرە؛ چەڵتووکجاڕ؛ گرنجاڕ؛ شالیگا؛ کێڵگەی برنج ⚑ شالیزار

**برنجاس / b(i)rincas/**: ☜ **برنجداس**

**برنجبەشیر / b(i)rincbeşîr/**: ناو. گرنجبەشیر؛ شیروبرنج ⚑ شیربرنج

**برنجداس / b(i)rincdas/**: ناو. برینجداس؛ برنجاس؛ کلاوزرە؛ گیایەکە لە بنەماڵەی گیابەند و تەرخون، گەڵاکانی چەشنی گەڵای گێزەرە بەڵام گەورەتر. لە بەشی لاوەکی و سەرەوەی لاسکە ڕەقەکەی گوڵی زەرد و ورد دەگرێت ⚑ برنجاسف

**برنجکوت / b(i)rinckut/**: ناو. ١. دینگ؛ دنگ؛ دەسک و سندۆل ٢. دینگچی؛ کەسێ چەڵتووک ئەکوتێ ⚑ ١. دنگ ٢. دنگ‌کوب

**برنجۆک / b(i)rincok/**: ناو. ١. موو؛ نەخۆشییەکی زۆر بەژانە لە پەنجە دێت ٢. پارچەیەکی تۆڕی ناسکە ژنان دەیکەنە دەسماڵی سەر ‹بە نووکی تیری شۆخێکی کەوا چۆخ/ لە بەرما تەن بووە جامەی برنجۆک «مەحوی»› ⚑ ١. کژدمە ٢. پارچەی وال

**برنجە / b(i)rince/**: ☜ **برنج ـ١**

**برنجەجاڕ / b(i)rincecař/**: ☜ **برنجاڕ**

**برنجی / b(i)rincî/**: ئاوەڵناو. ١. بە ڕەنگی برنج ٢. /مەجاز/ هەرە باش ⚑ ١. بە رنگ برنج ٢. بسیار خوب

**برنگ[1] / b(i)ring/**: ناو. ١. ☜ **برینگ** ٢. ئەو بەشە لە خوری مەڕ کە بە سەر پێستانەوەیە و چەورایی و نەرمی زۆرترە ⚑ ١. ☜ **برینگ** ٢. پشم روی پوست گوسفند

**برنگ**[٢]: ↓

⊡ **برنگ دان:** تووڕ هەڵدان؛ فڕێ دان؛ هاویشتن ☰ پرت کردن

**برنگ**[٣]: پێرۆ. ← **وشك‌وبرنگ**

**برنگه** / b(i)ringe/: ☜ **برینگ**

**برنگەوان** / b(i)ringewan/: ☜ **برینگچی**

**برنەڤە** / birneve/: ☜ **بردنەوە**

**برنەوە** / birnewe/: ☜ **بردنەوە**

**برۆز** / biruz/: ئاوەڵناو. دیار؛ ئاشکرا ☰ آشکار

**برۆسک** / b(i)rusk/: ☜ **بریسکه**

**برۆسکه** / b(i)ruske/: ناو. وریسکە؛ بریسکه ☰ آذرخش

**برۆ** / b(i)ro/: ناو. ئەبرۆ؛ برھ؛ بورگ ‹وتم ئایا بە زاری خۆت ئەپرسی حالی زاری من؟/ بڕۆی هێنایە یەک وەک شکلی لا، یەعنێ کە بێزارم! «نالی»› ☰ ابرو

⊡ **بڕۆی کەسێ تاشین:** *[کنایه]* ڕسوا کردنی کەسێک ☰ آبروی کسی را بردن

**برۆش** / biroş/: ☜ **بەرۆش**

**برووساندن** / b(i)rûsandin/: چاوگ. ١. پریشک ئاویژتن ٢. ترووسکە دان ☰ ١. جرقه زدن ٢. تابیدن

**برووسقاندن** / b(i)rûsqandin/: چاوگ. پرووسقاندن؛ بزرکاندن ☰ بُریدن (شیر)

**برووسقیان** / b(i)rûsq(i)yan/: چاوگ. پرووسقیان؛ بزرکان؛ هەڵگەڕانی هەندێک تەوش وەک شیر ☰ بُریدن (شیر)

**برووسک** / b(i)rûsk/: ☜ **برووسکه**

**برووسکان** / b(i)rûskan/: چاوگ. بریقە دان؛ برووسکیان؛ برووسکین ☰ درخشیدن

**برووسکاندن** / b(i)rûskandin/: چاوگ. تێپەڕ. //برووسکاندت؛ دەبرووسکێنی؛ ببرووسکێنە// برووسکە دانەوە ☰ بازتابیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ــــ/ چاوگی نەرێنی: نەبرووسکاندن

**برووسکانەوە** / b(i)rûskanewe/: چاوگ. تێنەپەڕ. //برووسکایەوە؛ دەبرووسکێیەوە؛ ببرووسکێیەوە// بریقانەوە؛ درەوشانەوە ☰ بازتابیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: برووسکاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەبرووسکانەوە

**برووسکه** / b(i)rûske/: ناو. برسکە؛ برووسک: ١. بریقە ‹لە برووسکەی سەر گۆنە/ ئاگر بەر بووە کای کۆنە «پیرەمێرد»› ٢. خاڵی بوونەوەی کوتوپڕی باری کارەبایی هەوران لە هەوادا کە بەرق وگرمەیەکی بەقەوەت بەدیدێنێ ‹ترووسکەی برووسکەی شەوی دەم بەهاری بەهەورە/ لە سەر عاسمانی زەوی ڕاخوشاوە «سوارە»› ٣. بەرقییە؛ بورقی؛ تێلگراف؛ ئامێرێکی پێوەندی بۆ ناردن و وەرگرتنی پەیام لە ڕێگای دوورەوە، بە شێوەی گواستنەوەی کارەبایی کۆد و نیشانە ☰ ١. درخشش ٢. آذرخش ٣. تلگراف

**برووسکەدار** / b(i)rûskedar/: ئاوەڵناو. چلقۆک؛ بەبریقە ☰ پرتوافکن؛ پرتوبخش

**برووسکیان** / b(i)rûkyan/: ☜ **برووسکان**

**برووسکین** / b(i)rûskîn/: ☜ **برووسکان**

**برووسین** / b(i)rûsîn/: چاوگ. پریشک دان ☰ درخشیدن

**برووقه** / b(i)rûqe/: ناو. بریکە؛ بریقە ☰ درخشش

**برووک** / b(i)rûk/: ناو. ڕەوتی وەستانەوەی باران بۆ ماوەیەک ☰ توقف باران برای مدتی کوتاه

**برووکیای** / b(i)rûkyay/: چاوگ. ١. برووسکیان؛ ترووسکانەوە ٢. چاو قرتاندن؛ چاو داگرتن ☰ ١. درخشیدن ٢. چشمک زدن

**برووویسی** / birûwîsî/: ناو. برووسکەی ئاسمان ☰ برق آسمان

**برەش** / bireş/: ئاوەڵناو. هەژار و بێچارە ☰ بینوا

**برەڤان / birevan/**: ناو. ناوبژی؛ نێوبژی ≡ میانجی

**برەو / b(i)rew/**: ناو. باو؛ ڕەواج: ۱. مـۆرە؛ ڕمـێن؛ گەڕ؛ ڕەونەق؛ گەردان؛ ڕەوتی کەڵک وەرگـرتنی گشتی یان لەسەریەک ۲. گەشە؛ پێشڕەوت ‹ئەو ئیبراهیمەی تۆ نەوەی ئەوی/ لە کوردستانا دەرکەوت برەوی «پیرەمێرد»› ≡ ۱و۲. رواج

**برەودار / b(i)rewdar/**: ئاوەڵناو. ڕووبـازاڕی؛ لـەباو؛ بەڕمێن ≡ مرغوب و رایج

**برە / birh/**: ☜ برۆ

**بری**[۱] **/ b(i)rî/**: ئامراز. بات؛ جیات؛ جیـاتی؛ لـەبری ≡ بەجایِ

**بری**[۲]: ☜ بریا

**بریا / birya/**: سارستە. بری؛ خۆزگا؛ خۆزیا؛ خوەزیا؛ خوەزگە؛ خۆزی؛ کاشکا ‹سـەد بریـا بمزانیبـا ئـەو گوڵەم میوانی کێیە/ سەبارەت بە یاری خۆم ئـاوەدان بێ ئەو جێیە «فولکلۆر»› ≡ کاش

**بریان**[۱] **/ biryan/**: چاوگ. ۱. بران؛ بردران ‹بریا بـۆ هەولێر› ۲. دۆڕان‹ماڵم بریـا› ≡ ۱. بُـردە شـدن ۲. باختن

**بریان**[۲]: ئاوەڵناو. برژاو؛ برژیاگ؛ براشتی؛ برێشتە ≡ برشتە؛ بریان

**بریانکراو / biryank(i)raw/**: ئاوەڵناو. براشـتی؛ برژاو؛ بۆدراو ≡ بودادە

**بریانی / biryanî/**: ناو. ۱. بـەرخی بـە گیپـە لـە تەندووردا ‹قوربانی ئەو جەنابە کە بریـانێکی بـەرخ/ ئیزهاری زەهری خۆی وەکـوو بـوو بـەو قـەرارە کـرد «بێخود»› ۲. چۆنەر؛ لەبوو ≡ ۱. کباب برەی تنوری ۲. لبو

**بریای / biryay/**: چاوگ. بـران: ۱. دۆڕان؛ دانیـان ۲. بریان؛ هەڵگیران ≡ ۱. باختن ۲. بردە شدن

**بریتی / birîtî/**: ☜ بڕیتی

**بریس / b(i)rîs/**: ناو. بریکە؛ ترووسک ≡ درخشش

**بریسک / b(i)rîsk/**: نـاو. ۱. تـەزووی بـەژان ۲. ئاورینگ ≡ ۱. تیر کشیدن بدن ۲. شرار

**بریسکان / b(i)rîskan/**: چـاوگ. درەوشـین ≡ درخشیدن

**بریسکانەوە / b(i)rîskanewe/**: چـاوگ. درەوشینەوە ≡ (باز)تابیدن

**بریسکە / b(i)rîske/**: نـاو. بریسـوو؛ بروسـک؛ برووسکە ≡ برق آسمان

⊡ **بریسکە دان/ دانەوە** بریقە دان/ دانەوە ‹بە سـەر گۆنای سپیدا خشڵی زێڕینە بریسـکەی دا/ پـەری سەر کێوی قافیش هێندە پرچی زەردی خۆی لـێ دا «پیرەمێرد»› ≡ درخشیدن

**بریسکەبریسک / b(i)rîskeb(i)rîsk/**: ناو. بریقەبریق ≡ درخشش پیاپی

**بریسکەدار / b(i)rîskedar/**: ☜ بریکەدار

**بریسکینەوە / b(i)rîskînewe/**: چاوگ. بریقـە دان ≡ درخشیدن

**بریسو / b(i)rîsû/**: ☜ بریسکە

**بریشتە / b(i)rîşte/**: ئاوەڵـناو. برشـتـە؛ برێشـتـە؛ برژیاگ ≡ برشتە

**بریڤ / b(i)rîv/**: ☜ بریو

**بریڤان / b(i)rîvan/**: چاوگ. ۱. وشـیار بـوون ۲. ئاگاداری کردن؛ هۆش پێوە بوون ۳. ترووسـکان؛ تیشک دانەوە ٤. برقین؛ بریقە دانەوە ≡ ۱. هُشیار بودن ۲. مراقبت کردن ۳. درخشیدن ۴. برق زدن

**بریق / b(i)rîq/**: ناو. ۱. ئافتاوە؛ بریک ۲. ترووسکە ≡ ۱. آفتابە ۲. درخشش

**بریقان / b(i)rîqan/**: چـاوگ. ترووسـکان؛ برووسکان ≡ درخشیدن

**بریقاندن / b(i)rîqandin/**: چـاوگ. تێـپـەڕ. //بریقاندت؛ دەبـریقێنی؛ ببریقێنـە// ترووسـکە پـێ دان ≡ برق انداختن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەبریقاندن

**بریقانەوە / b(i)rîqanewe/**: چـاوگ. تێنەپـەڕ.

//بریقایەوە؛ دەبریقیەوە؛ ببریقەوە// درەوشان؛ برووسکان ‹جۆگە وردەکان ئەکشێن سەرەو خوار/ ئەبریقێنەوە وەک توولەی ڕەشمار «گۆران»› 🇮🇷 درخشیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: بریقاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەبریقانەوە

**بریق‌باق** / b(i)rîqbaq/: ☜ **بریکە**

**بریقە** / b(i)rîqe/: ناو. بریکە؛ برووسکە ‹بە ناز لار بگرە سەری بێ پووشین/ با بریقەی بێ کلاوزەڕ چین ـ چین «گۆران»› 🇮🇷 درخشش

⊡ **بریقە دانەوە:** کەوانە کردنی برووسکە لە شووشە یان ئاو 🇮🇷 انعکاس یافتن

**بریقە لێ خستن:** ☜ **بریکە لێ خستن**

**بریقەبریق** / b(i)rîqeb(i)rîq/: ناو. برووسکەی بە شوێن یەکا 🇮🇷 درخشش پیاپی

**بریقەدار** / b(i)rîqedar/: ☜ **بریکەدار**

**بریقەدەر** / b(i)rîqeder/: ☜ **بریکەدار**

**بریک** / b(i)rîk/: ناو. ئافتاوە؛ لوولێنە؛ بریق 🇮🇷 آفتابە

**بریکا** / b(i)rîka/: سارستە. بریا؛ خۆزیا؛ خوەزگە؛ خۆزی 🇮🇷 کاشکی

**بریکار** / b(i)rîkar/: ناو. وەکیل؛ وەکێل؛ نایب: ۱. دەمڕاس؛ کەسێ کە لە لایەن کەس یان کەسانێکی ترەوە بۆ ئەنجام دانی کارێک ڕاسپێردراوە ۲. پارێزەر؛ قانوونزانێ کە لە دادگا پاراستنی مافی بەرتاوان ئەگرێتە ئەستۆ ۳. نوێنەر؛ هەڵبژاردەی خەڵک بۆ پارلەمان ٤. جێگر؛ دووەم کەس لە زنجیرە پلەی ئیداریدا 🇮🇷 ۱تا۴. وکیل

**بریکاری** / b(i)rîkarî/: ناو. وەکیلی: ۱. دۆخی بریکار بوون ۲. کار و پیشەی بریکار 🇮🇷 ۱و۲. وکالت

**بریکان** / b(i)rîkan/: چاوگ. برووسکان 🇮🇷 درخشیدن

**بریکاندن** / b(i)rîkandin/: چاوگ. برووسکاندن 🇮🇷 درخشاندن

**بریکە** / b(i)rîke/: ناو. درەوشە؛ برووسکە؛ بریس؛ بریسکە؛ چروسکە؛ تروسکە؛ برووسک؛ بەرق؛ زەرق؛ برقەبرق؛ بریق‌باق؛ چۆنیەتی درەوشانەوە 🇮🇷 درخشش

⊡ **بریکە لێ خستن:** بریقە لێ خستن؛ تەواو خاوێن و بێگەرد کردنەوە 🇮🇷 برق انداختن

**بریکەدار** / b(i)rîkedar/: ئاوەڵناو. وەرشەدار؛ ورشەدار؛ وریشەدار؛ ورچەدار؛ درەوشەدار؛ بەبریقە؛ بریقەدار؛ بریقەدەر؛ شۆقدار؛ بریسکەدار؛ برقۆک؛ بە برووسکە؛ بە تایبەتمەندی تیشک دانەوەوە 🇮🇷 براق

**بریکەنێ** / b(i)rîkenê/: سارستە. خۆزگا؛ کاشکا؛ خۆزی 🇮🇷 کاشکی

**بریگەرد** / b(i)rîgerd/: ناو. دەروێش؛ دەورێش 🇮🇷 درویش

**برین** / b(i)rîn/: ناو. ۱. زام؛ زەخم؛ زەخمەل؛ کولک؛ چوێ؛ نژد؛ ڕێش؛ گەزندی پێست ۲. /مەجاز/ خەم و خەفەت 🇮🇷 ۱. زخم ۲. غم و غصە

⊡ **برین کولاندنەوە:** خەم و خەفەت وە بیر هێنانەوە 🇮🇷 زخم کهنه را ریش کردن

**برین کولانەوە:** خەم و خەفەت وە بیر هاتنەوە 🇮🇷 زخم کهنه ریش شدن

**برینارەش** / b(i)rînareş/: ناو. تیراوێ؛ سیازام؛ لاڕەشە 🇮🇷 سیاەزخم

**بریناو** / b(i)rînaw/: ☜ **ئاوەڵناو**

**برین‌پێچ** / b(i)rînpêç/: ناو. هاریکاری بژیشک 🇮🇷 پزشکیار

**برین‌پێچی** / b(i)rînpêçî/: ناو. زەخم‌پێچی؛ وەرپێچە 🇮🇷 پانسمان

**برینج** / b(i)rînc/: ☜ **برنج**

**برینج‌داس** / b(i)rîncdas/: ☜ **برنجداس**

**برینجه** / b(i)rînce/: ناو. ١. بزه ٢. شەپۆلی وردی ئاوی چۆم ‹چۆمەکە برینجە دەکا› ≡ ١. لبخند ٢. ریزموجهای آب رودخانه

**بریندار**[1] / b(i)rîndar/: ناو. زامار؛ زامدار؛ ڕیشدار؛ کولدار؛ کەسێ کە گەزندێکی پێگەیشتووە ‹گرفتارم بە نازی چاوەکانی مەستی فەتتانت/ بریندارم بە تیری سینەسووزی نیشی موژگانت «مەستوورە»› ≡ زخمی

**بریندار**[2]: ئاوەڵناو. زامار؛ زامدار ‹دڵ بریندار بێ، نەوەک ناسۆری تیری تانە بێ/ سینەچاکی چاکە بۆ تیری موژەی نیشانە بێ «پیرەمێرد»› ≡ زخمی

**برینکاری** / b(i)rînkarî/: ناو. عەمەل؛ نەشتەرگەری ≡ عمل جراحی

**برینگ**[1] / b(i)rîng/: ناو. برنگ؛ برنگە؛ بڕێن؛ بریتک؛ بڕینگە؛ هەورینگ؛ جەور؛ جەو؛ جەهرێ؛ مقەستی گەورە بۆ هەڵپاچینی کولکەی ئاژاڵ ≡ دوکارد

⊡ **برینگ هێنانەوە**: زیاد کردنی خوری ماڵات، ئەوەندەی کە بۆ برینگ بڕینەوە ببێ ‹مەڕەکان برینگیان هێناوەتەوە› ≡ پشم درآوردن دوبارەی احشام

**برینگ**[2]: پێرۆ. ← **وشك‌وبرینگ**

**برینگاندن** / b(i)rîngandin/: چاوگ. قەدان؛ وێستانی باران ≡ بند آمدن باران

**برینگچی** / b(i)rîngçî/: ناو. برنگەوان؛ برینگەوان؛ برینگی؛ ئەوەی بە برینگ مەڕ دەبڕێتەوە ≡ پشم‌چین

**برینگەر** / b(i)rîger/: ناو. جەڕڕاح؛ برینکار؛ نەشتەرکار ≡ جرّاح

**برینگەوان** / b(i)rîngewan/: ☜ **برینگچی**

**برینگی** / b(i)rîngî/: ☜ **برینگچی**

**بریو** / b(i)rîw/: ناو. بریڤ؛ پەلە؛ لەز ≡ عجله

**بریەتی** / biryetî/: ☜ **بریتی**

**بریەمێ** / biryemê/: ناو. کووزەڵە؛ کووز ≡ ترتیزک/ شاهی آبی

**برێ** / b(i)rê/: ناو. برا ≡ برادر

**برێتی**[1] / b(i)rêtî/: ناو. بریتی؛ بریەتی؛ کینایە ≡ کنایه

**برێتی**[2]: ئامراز. بریتی؛ بریەتی: ١. دەبێتە؛ دەکاتە ٢. باتی؛ جیاتی ≡ ١. عبارت است از ٢. بەجای

**برێژنای** / b(i)rêjnay/: چاوگ. برژاندن ≡ برشته کردن

**برێژیان** / b(i)rêjyan/: چاوگ. برژان ≡ برشتن

**برێژیای** / b(i)rêjyay/: چاوگ. برژان ≡ برشته شدن

**برێشتە** / b(i)rêşte/: ☜ **بریشتە**

**برێشکە** / b(i)rêşke/: ئاوەڵناو. برێشگە؛ بۆدراو (بۆ دانەوێڵە) ‹برێشکەی شەخست کرد بە پەنسیلین/ جگەر بە ترشت کردووە بەکنین/ ئافەرین زانین! هەزار ئافەرین! «قانع»› ≡ بوداده

**برێشگە** / b(i)rêşge/: ☜ **برێشکە**

**برێشم** / b(i)rêşim/: ☜ **هەورێشم**

**برێڤ** / b(i)rêv/: ئاوەڵناو. وریا؛ ئاگادار ≡ آگاه

**برێڤان** / b(i)rêvan/: چاوگ. وریا بوونەوە؛ ئاگادار بوون ≡ آگاه شدن

**بڕێن** / birên/: ناو. ١. ☜ **برینگ** ٢. گیایەکی شیرەدارە ≡ ١. ☜ **برینگ** ٢. از گیاهان دارویی

**برێنج** / b(i)rênc/: ☜ **برنج**

**برێنەکەران** / b(i)rênekeran/: ناو. گوڵان؛ بانەمەڕ؛ دووهەم مانگی بەهار ≡ اُردیبهشت

**بڕ**[1] / biř/: ناو. ١. ئەندازە؛ هەند ‹بڕی شەش هەزار تمەن› ٢. یەکەی هەژماردنی چێو ‹دوو بڕ دار بێنە!› ٣. بڕشت؛ دەسچوویی ‹بڕی کۆمەڵایەتی› ٤. هەندی کارکۆیی؛ ڕەسایی ‹بڕی ئەو چرایە تا کوێیە؟› ٥. توان؛ دەوام؛ تابشت ‹بڕ ناکەم لەم کێوە سەرکەوم› ٦. پەل؛ لک ‹برا! تۆ ئێژی جافم، لە کام

بڕی؟› ۷. بەشێ لە شتێ کە بڕاوە ۸. بڕگە؛ شوێنی دابڕاو ۹. کار و ڕەوتی تێکەڵ کردن ‹بڕ دان› ۱۰. کار و ڕەوتی بڕین ‹قەڵت و بڕ› ۱۱. کار و ڕەوتی ڕێگە دان، بوار دان ‹ئەم ڕووبارە بڕ نادا› ۱۲. ساڵ لە تەمەنی یەکسمدا ‹جوانووەکە یەک بڕە یان دوو بڕە؟› ۱۳. سنوور؛ ئەو شوێنەی دوو پارچە زەوی یا دوو ولات لێک جیا دەکاتەوە ۱٤. هەندێ لە دەغڵ کە سەرپاڵە بۆ دروون دیاری دەکا ▤ ۱. مقدار؛ میزان ۲. واحد شمارش چوب؛ قطعه؛ تکه ۳. اعتبار؛ وجهه ۴. بُرد ۵. تاب؛ دوام ۶ گروه؛ شاخه ۷. قطعه ۸. بخش ۹. کار بُر زدن ۱۰. بُرش؛ قطع ۱۱. گُدار ۱۲. در ترکیبات معادل سال برای چهارپایان ۱۳. مرز دو قطعه زمین یا دو سرزمین ۱۴. حدود مشخصی از گندمزار هنگام درو

▣ **بڕ پێ دان:** قسە لە قسەدا کردن ▤ در میان سخن آمدن

**بڕ (تێ) کەفتن:** جیا بە جیا بوون؛ تیکە ـ تیکە بوونەوە ▤ دسته ـ دسته شدن

**بڕ دان:** جیا کردنەوەی هێندێ لە هێندێکی تر ‹گورگ داویە لە ڕانەکە و چەند سەرێکی بڕ داوە› ▤ جدا کردن

**بڕ شکان:** تینوویەتی شکان ‹هەرچی ئاو دەخۆمەوە، برم ناشکێ› ▤ عطش رفتن

**بڕ کردن:** توانین؛ توانا هەبوون ‹لەبەر حوکمی نیگایا قاتە هوشیار/ هەتا چاوی بکا بڕ، مەستە هەر مەست! «مەحوی»› ▤ تاب آوردن؛ دوام آوردن

**بڕ**[۲]: ↓

▣ **بڕ بوون:** تەرە بوون؛ تاک بوونەوە ‹ئەم گیسکە لە مێگەل بڕ بووە› ▤ جدا افتادن

**. بڕ**[۳]: پاشەوشە. ۱. بڕندە؛ بڕەوە ‹دابڕ› ۲. ببڕ؛ بڕێن ‹سەربڕ؛ پەتبڕ› ۳. قەیچی کەر ‹پارچەبڕ› ٤. تەواوکەر ‹دووبڕ› ٥. نەهێڵ؛ قوتارکەر ‹نان و دۆبڕ› ٦. شکێن ‹کاربڕ› ۷. دز؛ چەپاوکەر ‹کە تۆ گیرفانپڕی، گیرفانبڕی، من هەر هەژار ماوم «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ▤ ۱تا۳. بُرّنده ۴. تمام‌کننده ۵. از بین برنده ۶. خراب‌کننده ۷. ـ بُر

**بڕ**[٤]: پێڕۆ. ← **تەڕوبڕ؛ گوشتوبڕ**

**بڕ**[٥]: لێل. ← **بڕوبیانو؛ بڕوبەهانە**

**بڕادە** /b(i)řade/: ناو. خاکەمڕەمەند ▤ بُراده

**بڕان** /b(i)řan/: چاوگ. بڕیان: ۱. دوایی هاتن ‹پێکەنین، شادی، خۆشی بڕاوە/ هەمووی بە داوی پیری گیراوە «فولکلۆر»› ۲. جودا بوون ۳. لێک‌بوونەوە ٤. دابڕان؛ لەت بوون ٥. *[مەجاز]* نەمان؛ تەواو بوون ▤ ۱. پایان یافتن ۲. جدا شدن ۳. بریده شدن ۴. قطع شدن ۵. تمام شدن

▣ **پێ بڕان:** پێ گەیشتن؛ بە نسیب بوون ‹ئەوان پێیان بڕێ دەسکەوت و قازانج/ بە قوڕ گیرێ دەبا سەد ماڵەکرمانج! «هێمن»› ▤ نصیب شدن

**لێ بڕان:** ۱. دابڕان؛ جیا بوونەوە ‹پاژێکی لێ بڕاوە؛ لە کەس‌وکاری بڕاوە› ۲. بڕیاری کۆتایی دان؛ قەراری یەکجاری دان ‹لێ بڕاوم بچم› ▤ ۱. جُدا شدن ۲. عزم را جزم کردن

**بڕاندن** /b(i)řandin/: چاوگ. بڕین ▤ قطع کردن

**بڕانە** /b(i)řane/: ناو. ۱. جیرە و مووچەی دیاریکراو ۲. باج و پیتاکی ساڵانەی میری ▤ ۱. مستمری ۲. باج و خراج سالانه

**بڕانەوە** /b(i)řanewe/: چاوگ. تێنەپەڕ. //بڕایەوە؛ دەبڕێیەوە؛ ببڕێوە// بڕیانەوە: ۱. کۆتایی هاتن ‹ئێستا کە لەم بڕانەوەی چەرخی بیستا، کە هەوای ئازادی و ڕزگاری هەڵیناوین ... «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ۲. لەت بوون ۳. جیاوە بوون ▤ ۱. تمام شدن ۲. قطع شدن ۳. جدا شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: بڕاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەبڕانەوە

**بڕاو** /b(i)řaw/: ئاوەڵناو. بڕدراو؛ بڕیاگ؛ بڕیندار ‹بۆ گۆشەیێکی تیغی بڕۆی، وەک ژنانی میسر/

پەیوەستە ئارەزووی لەپی دەستی براومە «بێخود»»
▤ مجروح

**برپانە / biřbane/**: ئاوەڵناو. زلحۆرت؛ زەبەلاح؛ تەزە ▤ لندهور

**بڕ برِ / biřbiř/**: ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. ١. کەم ـ کەم؛ تۆزە ـ تۆزە ٢. لەت ـ لەت؛ پارچە ـ پارچە ‹بڕ ـ بڕی کردن هەریەک لە لایە/ هەریەکە بۆخۆی بوو بە کوێخایە «قانع»› ▤ ١. کم ـ کم ٢. تکه ـ تکه

**بڕبڕاگە / biřb(i)řage/**: ☜ **بڕبڕە**[1]**ـ١**

**بڕبڕاگی / biřb(i)řagî/**: ☜ **بڕبڕە**[1]**ـ١**

**بڕبڕە**[1] **/ biřb(i)ře/**: ناو. ١. بڕبڕاگە؛ مۆرەغە؛ مرۆخە؛ مۆرخە؛ مورتخە؛ مۆرتخە؛ مورەتخە؛ پشتەمازە؛ بڕگە؛ بڕبڕاگی؛ گازەرا؛ گەوبەند؛ گەوبەندە؛ مازگە؛ مازی؛ مازە؛ مەژگورە؛ کرک؛ کرکمازێ؛ کرکپشت؛ گاڕگاڕە؛ سنسل؛ تەرختە؛ تێغەرە؛ مووری؛ ناڤدەرگ؛ دۆرپشت؛ ڕیزێک ئێسکی گرۆڤەری ناوبەتاڵ لە درێژەی پشتی مۆرەدارانداـ کە نوخاعی تێدایە ‹لوولەی تفەنگ لە بڕبڕەی پشتی قایم بوو/ تەقەی پۆستاڵ بە شوێنەوە هەر هات و هەر چوو «گۆران»› ٢. داسی ددانەدار وەک هەرە ٣. *[مەجاز]* خزمی نزیک ▤ ١. ستون فقرات ٢. داس دندانەدار ٣. خویشاوند نزدیک

**بڕبڕە**[2]: ئاوەڵناو. بڕـ بڕ؛ کەم ـ کەم ▤ کم ـ کم

**بڕبەن / biřben/**: ☜ **بڕبەند**

**بڕبەند / biřbend/**: ناو. مرمەند؛ بڕبەن؛ بڕوەن؛ بڕبەنگ؛ بربەنگ؛ نەربەند؛ ڕنەک؛ سوان؛ قەورە؛ قەڵبە؛ کارتیک؛ کارتیغ؛ کارتیخ؛ کارتی؛ کارتێ؛ خورۆک؛ چووەسۆ؛ سێسوو؛ مەورە؛ موورە؛ مەورەت؛ مۆرەت؛ مەوەرد؛ مەورەد؛ مووڕەد؛ مووڕەت؛ ئامرازێ (زۆرتر) لە پۆڵا کە گشت یان بەشێک لە ڕووەکەی گرنج ـ گرنج یان زوورە و بۆ ڕنین یان سوانی چێو یان کانزا دەبێ ▤ سوهان

**بڕبەنگ / biřbeng/**: ☜ **بڕبەند**

**بڕتەی / biřtey/**: چاوگ. بڕین ▤ بریدن

**بڕخەلاس / biřxelas/**: ناو. جۆرێ کایەی منالانە ▤ از بازی‌های کودکانه

**بڕدران / biřd(i)ran/**: چاوگ. هەڵپەکانەدن؛ هەڵبڕان ▤ بُریده شدن

**بڕدراو / biřd(i)raw/**: ئاوەڵناو. ١. ☜ **بڕاو** ٢. جیاوەکراو ▤ ١. ☜ **براو** ٢. جدا شده

**بڕدۆنە / biřdone/**: ئاوەڵناو. زلحۆرت؛ زەلامی ناقۆلا و تەزە ▤ لندهور

**بڕرە / biřře/**: ناو. شفرە؛ ددانی بەراز ▤ **نیش گراز**

**بڕرەک / biřřek/**: ناو. نێرەبەراز؛ یەکانە؛ ئێکانە ‹بزەی هەرگیز نەبینرابوو لە سەر لێو/ دەغەزری وەک یەکانە و بڕرەکی کێو «هێمن»› ▤ **گُراز**

**برس / b(i)řis/**: ☜ **برست**

**برست / b(i)řist/**: ناو. بڕس؛ بڕەس؛ بڕەست؛ وزە؛ توانا؛ تین؛ تان؛ توێ؛ تابشت؛ تاوشت؛ توانست؛ توانشت؛ هێس؛ هازی؛ هاز؛ هەون؛ دەگەر؛ گرک؛ کێش ‹دێم هەتا هەمبێ برست و بیر و هۆش/ گەر گلاشم کوردەواری و ئێوە خۆش «هێمن»› ▤ توان؛ نا؛ تاب

⊡ **برست (لێ) بڕین**: بڕەس لێ بڕین؛ لە هێز و گوڕ خستن ‹بۆ زینێ بە دەردێ چووبوو، ئەستی/ گریان و شەپۆڕ بڕی بڕەستی «هەژار، *مەم و زین*»› ▤ از تک‌وتا انداختن

**برسکان / b(i)řiskan/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //برسکای؛ دەبرسکێی؛ ببرسکێ// ١. ☜ **بزرکان** ٢. لەخۆڕا قسە و پلار ئاویژتن ▤ ١. ☜ **بزرکان** ٢. گزافە گفتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: برسکاو/ چاوگی نەرێنی: نەبرسکان

**برسکاندن / b(i)řiskandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //برسکاندت؛ دەبرسکێنی؛ ببرسکێنە// ١. ☜ **بزرکاندن** ٢. لەخۆڕا قسەی تاڵ گوتن و پلار

تێ‌گرتن 🇮🇷 ۱. ☜ **بزرکاندن** ۲. گزافه گفتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـــ/ چاوگی نەرێنی: نەبڕسکاندن

**بڕش** / b(i)řiş/: ناو. بڕشت؛ هێزی بڕین ‹وتم بێباکە بۆ خوێنڕێژی ئەبرۆت؟/ وتی تیغ ئەز بڕش ناکا حەیا قەت «مەحوی»› 🇮🇷 بُرش

**بڕشت** / b(i)řişt/: ناو. ۱. کاری بڕین؛ قەڵش تێ خستن ‹کەچی ئەگریجان، حەلقەی عەقرەبچەم/ بڕشت دا وە نێش سەر مەودای دوودەم «مەلا وەلەد خان»› ۲. بڕش؛ هێزی بڕین ‹شێرە چۆبینە بڕشتی ماوە؟/ یان کەل و کول بووە، کۆڵی داوە؟ «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ۳. بەهرەی چێندراو ‹وەها لێک درابوو زەوی گشت لە گشت/ لە وەرزێترا یەک بە سەد بوو بڕشت «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ٤. زەمینی بەپیت ٥. بڕس؛ بڕست ‹لە بەر ئەو برا، لە برا برا/ بڕشتی برا ئەوی لەو برا «پیرەمێرد»› ٦. پارچەی بڕاو بۆ دروون ٧. کووز؛ قاش 🇮🇷 ۱و۲. بُرش ۳. بهرەی محصول ۴. زمین حاصلخیز ۵. تاب و توان ۶. پارچەی بُرش خوردەی آمادەی دوخت ۷. قاچ

**بڕفان ـ بڕفان** / biřfan biřfan/: ئاوەڵکار. بە هەڵەداوان؛ تون و بە پەلە ‹بڕفان ـ بڕفان هاوردی› 🇮🇷 شتابان

**بڕفەت** / biřfet/: ناو. دەرفەت؛ هەل 🇮🇷 فرصت

**بڕفێن** / biřfên/: ئاوەڵناو. قەپۆ؛ ڕفێن 🇮🇷 رُباینده

**بڕفێن ـ بڕفێن** / biřfên biřfên/: ناو. کاری ڕفاندن بێ پرسی خاوەنی ‹بوو بە بڕفین ـ بڕفین و هەرکی هەرچیکی وەبەر هات بردی!› 🇮🇷 غارت و چپاول

**بڕک**[۱] / biřk/: ناو. ۱. گیایەکی بۆنخۆشی کوێستانییە و گوڵێکی سپی دەگرێت ۲. تیکە چێوی بەکار بۆ هاویشتن بەرەو شتێ 🇮🇷 ۱. گیاهی خوشبو ۲. قطعه چوب مناسب برای انداختن به طرف چیزی

**بڕک**[۲]: ↓

⊡ **بڕک دان**: تووڕ دان؛ فڕک دان؛ فڕە دان 🇮🇷 پرت کردن

**بڕکدراو** / biřkd(i)raw/: ئاوەڵناو. تووڕدراو؛ پەرت کرایاگ 🇮🇷 پرت‌شده

**بڕکن** / biřkin/: ☜ **بنکڕ**

**بڕکە** / biřke/: ناو. ۱. دەستە؛ تاقم؛ گرۆیێ لە شتێ (زۆرتر ئاژەڵ) ‹بڕکەیێ لە ڕانەکە جێ‌ماوە› ۲. پنجی بێستان ‹شۆڕەژن بنکۆڵ نەکا بڕکەی، بە قرچەی نیوەڕۆ/ چۆن لە کاڵەک تێر دەبێ ئەو زگ‌زلە بێستانڕنە؟ «هێمن»› ۳. قەوارە؛ پارچەی تێری جلک ٤. گیایەکی بۆنخۆشە 🇮🇷 ۱. دسته (دام) ۲. بوتەی پالیزی ۳. قواره (پارچه) ۴. گیاهی خوشبو

**بڕکە ـ بڕکە**[۱] / biřke biřke/: ئاوەڵناو. گورۆ ـ گورۆ؛ دەستە ـ دەستە ‹مێگەلەکە بڕکە ـ بڕکە بوونەوە› 🇮🇷 دسته ـ دسته

**بڕکە ـ بڕکە**[۲]: ئاوەڵکار. دەستە ـ دەستە؛ گورۆ ـ گورۆ ‹ڕانەکەیان بڕکە ـ بڕکە هێناوە› 🇮🇷 دسته ـ دسته

**بڕکەمردە** / biřkemirde/: ناو. بەری بێستانی پنچک وشک بوو کە زوو دەگا و تامی ناخۆشە 🇮🇷 میوەای کە بوتەاش خشکیدە باشد

**بڕگە** / biřge/: ناو. ۱. بەش؛ سیلابل؛ بچووکترین یەکەی زمانی، دوای فونیم ‹ئازادی سێ بڕگەیە› ۲. بەند؛ بەشی جیاواز و دیاریکراو لە نووسراوەیەکی فەرمی کە بە ژمارە دیاری دەکرێ ‹لایەنەکان لە سەر چوار بڕگە ڕێکەوتن› ۳. بەش؛ پاژ ‹بەرنامەی ئەوشەومان لەخۆگری چەند بەش و بڕگەی جیاوازە› ٤. جێگەی شکاندنی جۆ بۆ ئاودێری ٥. شوێنی لەلەکراو لە دار یان ئاسن 🇮🇷 ۱. هجا؛ سیلاب ۲. ماده؛ بند ۳. بخش ۴. برشی از جوی برای آبیاری ۵. شیار روی چوب یا آهن

**بڕگە.بڕگە**[۱] / biřge biřge/: ئاوەڵناو. بڕە ـ بڕە؛ بە شێوەی یەک‌نەگر 🇮🇷 بند ـ بند

**بڕگە.بڕگە**[۲]: ئاوەڵکار. تیکە ـ تیکە؛ پچڕ ـ پچڕ؛ کوتە

ـ کوته؛ پەل ـ پەل؛ لەت ـ لەت؛ پارچە ـ پارچە؛ موور ـ موور مُقطّع

**برگەیی** / biřgeyî/: ناو. پێوەندیدار یان سەر بە برگەوە ‹شیعری برگەیی› هجایی

**برمە**[1] / biřme/: ناو. ۱. پرتەوبۆڵە؛ گوڕە و بۆڵەی کەسی تووڕە ۲. دیزەی چێشت تێدا کوڵاندن ۱. غرولند ۲. دیزی

**برمە**[2]: دەنگەناو. پڕمە؛ پرمە؛ دەنگ لە لووت هاتنی ئەسپ لە غلووریان صدای بینی اسب

**برمێن** / biřmên/: ئاوەڵناو. بە کار و ئازا و بەبڕشت کارا و قاطع

**برناق** / biřnaq/: ناو. گەروو؛ گەڵوو؛ قوڕگ گلو

**برندەیی** / biřindeyî/: ناو. تووژی؛ بڕندەیی تیزی

**برندە** / biřnde/: ئاوەڵناو. ببڕ برنده

**برنووتی** / biřnûtî/: ناو. نشووک؛ سعووتی؛ تۆزێکە بە کەپوو ئەکێشرێ لە باتی تووتن کێشان انفیه

**بروا** / biřwa/: ناو. باوەڕ؛ باوڕ ‹لە دڵمایە بڕوای بەرینی بە دەریا گەیشتن «سوارە»› باور

⊡ **بروا کردن:** باوڕ کردن؛ پێ قایل بوون ‹بڕوانە سووتنم، وەرە بڕوا کە من نەمام/ پەروانە ئیترم نییە پەروا، کە من نەمام «مەحوی»› باور کردن

**بروار** / biřwar/: ناو. قەدپاڵ؛ گەوە کمر کوه

**بروانامە** / biřwaname/: ناو. باوەڕنامە: ۱. نامەیەک کە دروستی هەڵبژێرانی نوێنەرێک ڕادەگەیەنێ ۲. کارنامە؛ بەرگەیەک کە نمرە و چۆنیەتی خوێندنی قوتابی تێدا نووسراوە ۱. اعتبارنامە ۲. کارنامە

**بروایی** / biřwayî/: ناو. بەرایی اجازه

⊡ **بروایی دان:** بەرایی دان؛ ڕێ پێ دان ‹دڵم بروایی نادا هەروا جێیبهێڵم› راه دادن

**برووبەهانە** / biřûbehane/: ☜ **برووبیانوو**

**برووبیانوو** / biř û b(i)yanû/: ناو. برووبەهانە؛ گرنە و گرۆی بێ مانا و بنشڕ عُذر و بهانه

**بروسقیاو** / b(i) řusq(i)yaw/: ئاوەڵناو. هەڵگەڕاو؛ بزڕکاو بُریده (شیر)

**بروەن** / biřwen/: ☜ **بڕەبەند**

**بروێش** / biřwêş/: ناو. بڕێش بلغور

**بروێشین** / biřwêşîn/: ناو. چێشتی بروێش؛ بڕێش آش بلغور

**برۆ**[1] / b(i)řo/: ناو. شفرە عاج

**برۆ**[2]: ئاوەڵناو. بزۆک و لە ڕۆیین کۆنەکەر رونده؛ برو

**برۆ**[3]: پێرۆ. ← **تاڵان و برۆ**

**برۆک** / b(i)řok/: ئاوەڵناو. گەڕۆک سیّار

**برووش** / b(i)řûş/: ناو. ولۆش؛ بروێش بلغور ریز

**بڕە**[1] / b(i)ře/: ناو. ۱. شفرە؛ ددانە دیارەکەی یەکانە؛ کەڵبی نێرەبەراز ۲. نێرەبەراز؛ یەکانە ۳. کاری چنینی گەنمەشامی ٤. بەیاری نێوان دوو کێڵگە ٥. خاکەی مشار ‹هەڕە لە بڕە جیا ناکاتەوە «مەسەل»› ٦. مشار؛ هەڕە ۷. *[مەجاز]* کچ؛ کەنیشک ۸. خاکی بڕەبند ۱. نیش گراز ۲. گراز ۳. برداشت ذرت ۴. فاصلەی میان دو زمین شخم‌زده ۵. خاک‌اره ۶ ارّه ۷. دختر ۸ بُراده

**بڕە**[2]: ئاوەڵناو. ۱. گوترە؛ بێ ژمار و پێوان ۲. مەختە؛ کونتەراتی ۳. *[مەجاز]* لەزەبر؛ لێهاتوو؛ تیژ ۱. رَمَکی ۲. کُنتراتی ۳. کارا

**بڕە**[3]: دەنگەناو. قیرە؛ گوڕە غرش؛ نعره

**بڕە ـ بڕە**[1] / b(i)řeb(i)ře/: ئاوەڵناو. برگە ـ برگە؛ پارچە ـ پارچە قطعه ـ قطعه؛ پاره ـ پاره

**بڕە ـ بڕە**[2]: ئاوەڵکار. ۱. برگە ـ برگە؛ لەتەلەت؛ لەتوکوت ‹کاکە! بڕەبڕە مەمانەدەرێ!› ۲. لەبەرێکەوە؛ وردە ـ وردە؛ نەختە ـ نەختە ‹بڕەبڕە خەڵک هاتن› ۱. پاره ـ پاره ۲. اندک ـ اندک

**بڕەبڕە**[2]: دەنگەناو. قیرەقیر؛ گرەگر نعره و غُرش

**بڕەدار** / b(i)ředar/: ناو. ئێزینگ؛ موور هیزم

**بڕەس / b(i)řes/:** ☜ **بڕست**

⊡ **بڕەس (لێ) بڕین:** ☜ **بڕست لێ بڕین**

**بڕەس ـ بڕەس**[١] **/ b(i)řesb(i)řes/:** ناو. هەڕا ـ هەڕا؛ هەوڵ و پەلەی زۆر ☰ شتاب

**بڕەس ـ بڕەس**[٢]: ناوەلکار. بـە هەڕاــ هـەڕا؛ ویـڕای هەوڵ و پەلەی زۆرەوە ☰ شتابان

⊡ **بڕەس ـ بڕەس کردن:** هەڵـمەت بـردن؛ پـەلامار دان بۆ چنگاوش بوون ☰ حمله بردن

**بڕەست / b(i)řest/:** ☜ **بڕست**

**بڕەک / b(i)řek/:** نـاو. مشار؛ هەڕەی دووکەسی ☰ ارّه

**بڕەمشـار / b(i)řem(i)şar/:** نـاو. ئاردەمشـــار ☰ خاک‌ارّه

**بـڕەودار / b(i)řewdar/:** ناوەلـناو. لەسەردەســتان؛ بەبرەو؛ لەباو ☰ رایج

**ـ بڕەوە / b(i)řewe-/:** پاشەوشـە. ـ بڕ (ئاسـن‌بـڕەوە) ☰ ـ بُر

**بڕهاڤ / biřhav/:** ناوەلناو. کۆ؛ کۆما؛ لە سەر یـەک هەڵچنراو ☰ بر هم انباشته

**بـڕی / b(i)ři/:** ناو. قرپ؛ قورت؛ قوڵـقێنە؛ قرقێنـە؛ گازی گەدە کە بە دەنگەوە لـە دەم دەر دێـت ☰ آروغ

**بڕیـار / biřyar/:** ناو. ١. ئەوەی مرۆڤ بە یارمـەتی زەین و بـیر دەریدەبـڕێ (هـەر ڕۆژێـک بـڕیارێک دەدەن!) ٢. خواستێ کە چیـدی دوودڵـی تێـدا نەبێ (بڕیار بێ چی‌تر ئـەم کـارە نەکـەم) ٣. بـیر و ڕای کۆتایی کە جێ بۆ قسـە نەهێڵـێتەوە (قـازی بڕیاری دا) ٤. قەول؛ بەڵێن؛ وەعد (بـڕیارە ئـەمجار پێکەوە بگەینە ساراکەی ولات و/ پێکەوەش لـە سـەر خەم دابکەین «شێرکۆ») ٥. فەرمانی فەرمی دادگە یان دامەزراوەیەکی دەوڵەتی (بـڕیاری پارلـەمان) ٦. گرێبەست؛ بڕیارنامـە ☰ ١. تصـمیم ٢. تصـمیم قطعی ٣. حُکم ۴. قول ۵. مصوّبه ۶. قرارداد

⊡ **بڕیـار دان:** ١. یـەک‌لایـی کـردنی خواسـتی دەروون بـۆ کـردن یـان نـەکردنی کارێـک ٢. حوکم دان؛ بڕیار دەرکـردن؛ فـەرمانی فـەرمی دان ٣. بەڵێن دان ☰ ١. تصمیم گرفتن ٢. حُکـم دادن ٣. قول دادن

**بڕیار دەرکردن:** ☜ **بڕیار دان ـ٢**

**بڕیار لە سەر دان:** پەسند کردن ☰ تصویب کردن

**بڕیـاردراو / biřyardiraw/:** ناوەلناو. ١. ڕای کۆتایی لە سەر دراو ٢. بەڵێندراو ☰ ١. تعیین حُکـم شـده ٢. وعده شده

**بڕیاردەر / biřyarder/:** ناوەلناو. ١. یەک‌لایی‌کەری خواستی دەروون ٢. دەسـەلاتدار؛ بەدەسـەلات؛ ڕاژوور ٣. بەڵێن‌دەر ☰ ١. تصمیم‌گیرنده ٢. حاکم ٣. وعده‌دهنده

**بڕیارنامـە / biřyarname/:** نـاو. گرێبەسـت ☰ قرارداد

**بڕیاگ / biřyag/:** ☜ **بڕاو**

**بڕیان / biřyan/:** ☜ **بڕان**

**بڕیانەوە / biřyanewe/:** ☜ **بڕانەوە**

**بڕیـاوان / biřyawan/:** نـاو. سەرپاڵـە؛ پێشـەنگی درەوکەران ☰ پیشرو دروگران

**بڕیتک / b(i)řitik/:** ناو. ١. شەقەمشار؛ مشاری دوو دەستک ٢. ☜ **بڕینگ** ☰ ١. ارّەی دونفره ٢. ☜ **بڕینگ**

**بـڕین / b(i)řin/:** چـاوگ. تێپـەر. //بـڕیت؛ دەبـڕی؛ ببڕە// وڕین؛ بڕیەی: ١. بڕینـەوە؛ قـەلت کـردن؛ لەت کردن؛ کـوت کـردن؛ بڕیـەیوە؛ شـتێک بـە ئامرازی بڕین (وەک کارد، چەقۆ، مشـار و...) لێـک جیا کردنەوە (دارەکەیان لە بنەوە بڕی) ٢. کۆتایی هێنان بە کارێک (من بـە قـووتی وەسلـی ئێـوارە و سبەینێی تۆ ئەژیم/ تۆ خودا تۆش نەیبـڕی مووچـە و بەراتم، ڕۆحەکەم! «بێخـود») ٣. بڕینـەوە؛ بڕیـەیوە (چـوار سـاڵ زینـدانیان بـۆ بـڕی) ٤. بـڕیان؛ ورە

بەردان؛ بێهێز بوون؛ هێز نەمان ‹من ئیتر بڕیام، ناتوانم بێم!› ٥. بڕیان؛ کۆتایی هێنان بە پێوەندی یان ڕاستییەک ‹لە شیری ببڕەوە! گەورەیە› ٦. دەست لە یەک بەردان ‹ئێوە قەت دەس لە یەک مەبڕن› ٧. بەرهەم هێنان؛ بەهرە دان ‹گەنمەکە یەک و دەی بڕیوە› ٨. پێوان؛ تێپەڕاندن؛ تێپەڕ کردن ‹هەنگەزەردە ئەبڕێ ڕێی دوور/ بۆ بینینی گولاڵەی سوور «گۆران»› ٩. بە ئەندازە لەت کردنی پارچە بۆ دوورینی جلوبەرگ ‹کفن بۆ خۆتان ببڕن/ هەر لە ئێستاوە بمرن «بێخود»› ١٠. بردنەوە؛ کردنە هی خۆ ‹بلیتەکەم خەلاتەکەی بڕی› ١١. دزین؛ چەپاو کردن ‹دەس بڕین؛ گیرفان بڕین› ١٢. هەڵپاچین ‹مەڕ بڕین› ☰ ١تا٦ بُریدن ٧. بهره دادن ٨. طی کردن ٩. بُرش دادن ١٠. برنده شدن ١١. دزدیدن ١٢. چیدن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: بڕیو/ چاوگی نەرێنی: نەبڕین

**برینگە / b(i)řînge/**: ☜ **برینگ**

**برینە / b(i)řîne/**: ناو. ژان؛ ئێشی منداڵ بوون ☰ درد زایمان

**برینەوە / b(i)řînewe/**: چاوگ. تێپەڕ. //بڕیتەوە؛ دەبڕیەوە؛ ببڕەوە// وڕینەوە: ١. جیا کردنەوە ٢. تەواو کردن؛ کۆتایی پێهێنان ٣. بڕیار دان ٤. هەڵپاچین ‹پەزەکانم بڕییەوە› ☰ ١. جدا ساختن ٢. به پایان رساندن ٣. تصمیم قطعی گرفتن ۴. چیدن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەبڕینەوە

**بریو / b(i)řîw/**: ناوەڵناو. بڕیاگ؛ شڕتوگوم ‹لێفەکۆنەی داڕزیو/ پرتووکاوی خوا بڕیو «قانع»› ☰ نابود

**بڕیە / biřye/**: ناو. بڕە؛ قونتەرات ☰ کنترات

**بڕیەکار / biřyekar/**: ناو. پەیمانکار؛ کەسێ کە بە کونتەرات کار دەکا ☰ پیمانکار

**بڕیەکاری / biřyekarî/**: ناو. کونتەرات ☰ پیمانکاری

**بڕیەی / biřyey/**: چاوگ. ١. بڕین ٢. بڕان ☰ ١. بریدن ٢. بریده شدن

**بڕیەیوە / biřyeywe/**: ☜ **بڕین**

**بڕێ[1] / biřê/**: ناوەڵناو. بازێ؛ بڕێک ‹بڕێ دار بەریان تاڵە› ☰ برخی

**بڕێ[2]**: ناوەڵکار. بازێ؛ بڕێک ‹بڕێ دانیشت و هەڵسا چوو› ☰ لختی

**بڕێ[3]**: جێناو. بازێ؛ بڕێک ‹هێندێک چوون و بڕێ مانەوە› ☰ عده‌ای

**بڕێ[4]**: ☜ **بڕین**

**بڕێژ / b(i)řêj/**: ناو. ڕیتە؛ ڕێجە؛ داڕێژگە؛ لاک؛ دەریچە؛ قاڵ؛ ڕیختمان؛ ڕێژە؛ ڕێژەک؛ قاڵبی داڕشتن ☰ قالب ریخته‌گری

**بڕێژە / b(i)řêje/**: ناو. بنێشت ☰ سقز

**بڕێس.بڕێس / b(i)řês b(i)řês/**: ناو. چەقە و هەرا؛ قوولەقوول؛ زەنا ـ زەنا ☰ جار و جنجال

**بڕێش / b(i)řêş/**: ☜ **بڕوێش**

**بڕێک / b(i)řêk/**: ☜ **بڕێ ١و٢و٣**

**بڕێن / b(i)řên/**: دەنگەناو. بڕێ: ١. گوڕەی با ٢. خوڕەی ئاو ٣. قوڕەی زگ ☰ ١. صدای باد ٢. شُرـ شُر آب ٣. صدای شکم

**بڕێنە / b(i)řêne/**: ناو. کاری پاچینەوەی بەرخ و کار ☰ عمل چیدن پشم و کُرک حیوان

**بز[1] / biz/**: ناو. ١. منداڵدان ٢. ☜ **بزن** ٣. ناوکی ئاسکی میسک ٤. چووز؛ جووز؛ سووک؛ کاری قامک بۆ قوون بردن ٥. بازنە؛ جەغز؛ جوغز؛ خەتی کەمە لە زەوی ٦. پیو؛ بەز؛ چەوری ناو زگ ☰ ١. زهدان ٢. ☜ **بزن** ٣. ناف آهوی مُشک ۴. انگولک ۵. دایره ۶. پیه

⊡ **بز پێوەکردن**: بز پێوەکردن؛ چووز پێوەکردن؛ کلکەبزێ دان؛ قامک بۆ قنگ بردن ☰ انگولک کردن

**بز دان**: ☜ **بز پێوەکردن**

**بز**[2]: ئاوەڵناو. زەق؛ زاق ‹چاوبز› 🇮🇷 برجسته

**بزافتن / b(i)zaftin/**: ☜ **بزاوتن**

**بزاڤ / b(i)zav/**: ناو. بزاو: ١. جوولە؛ لەبت؛ لەرە؛ ژیڵ؛ تەکان؛ گل‌پل؛ گلوێز؛ خولیوخاو؛ خولخاو؛ خلوور؛ جمش؛ جمێز؛ جمز؛ ژوول‌ژاڵ؛ جوول‌جاڵ؛ لەک‌وشەک؛ لەخش؛ کار و ڕەوتی گۆڕانی دۆخ یان شوێن ٢. تەڤگەر؛ بزووتنەوە؛ کرد و خەباتێکی بە بەرنامەوە بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی سیاسی، کۆمەڵایەتی یان فەرهەنگی ‹بزاڤی جووتیارانی ئاکرێ› 🇮🇷 ١. تکان ٢. جُنبش

**بزان / b(i)zan/**: ئاوەڵناو. زانا؛ دانا؛ زۆرزان 🇮🇷 دانا

**بزاو / b(i)zaw/**: ☜ **بزاڤ**

**بزاوتن / b(i)zawtin/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //بزاوتت؛ دەبزێوی؛ ببزێوە// بزافتن؛ جوولاندن؛ بزواندن ‹کە شیعری تۆ بزاوتی هەستی هەستان/ هەموو سەوداسەری سەربەستی هەستان «هێمن»› 🇮🇷 جنباندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: بزاوتوو/ چاوگی نەرێنی: نەبزاوتن

**بزاوتۆکە / b(i)zawtoke/**: ناو. جوولەی کەم 🇮🇷 حرکت کم

**بزاوتوو / b(i)zawtû/**: ئاوەڵناو. جوولاو؛ بزووتوو 🇮🇷 جُنبیده

**بزبزۆک**[1] **/ bizb(i)zok/**: ناو. گوڵێکە لە نەورۆزدا دەپشکوێ 🇮🇷 گلی بهاری

**بزبزۆک**[2]: ئاوەڵناو. بێ‌ئۆقرە؛ بزۆز؛ سەربزێو 🇮🇷 پُر جنب‌وجوش

**بزبێزی / bizbêzî/**: ناو. گیایەکە گوڵی سپی‌واش دەکا 🇮🇷 گیاهی است

**بزد / bizd/**: ناو. ترس؛ هەراس 🇮🇷 ترس

**بزدان / bizdan/**: چاوگ. ١. پسان؛ قەتیان ٢. ترسان 🇮🇷 ١. گسستن ٢. ترسیدن

**بزداندن / bizdandin/**: چاوگ. ١. پساندن ٢. ترساندن 🇮🇷 ١. گسلاندن ٢. ترساندن

**بزدم / bizdim/**: ئاوەڵکار. پێ‌دزە؛ پێ‌خشکە؛ پێ‌دزکێ؛ پاچرکێ؛ قولەپسکێ؛ ماتەمات؛ بە خشکە؛ تەلە ـ تەلە؛ پسووـ پسوو؛ هێدی و بێ‌چرکە؛ کاری لە سەر پەنجە ڕۆیشتن 🇮🇷 پاورچین

**بزدنۆک / bizdinok/**: ئاوەڵناو. ترس‌وەبەرهێن 🇮🇷 ترساننده

**بزدونەک / bizdunek/**: ئاوەڵناو. قزە؛ ترسۆنەک؛ ترسەنۆک 🇮🇷 ترسو

**بزدو / bizdû/**: ناو. جووچکە؛ قۆڕگ؛ جووچک 🇮🇷 دُنبالچه

**بزدهان / bizdihan/**: چاوگ. ترسان؛ ترسیان؛ بزدیان 🇮🇷 ترسیدن

**بزدهاندن / bizdihandin/**: چاوگ. ترساندن 🇮🇷 ترساندن

**بزدیان / bizdiyan/**: ☜ **بزدهان**

**بزدیای / bizdiyay/**: ئاوەڵناو. ترساو؛ ترسیاو 🇮🇷 ترسیده

**بزدین / bizdîn/**: چاوگ. پسان 🇮🇷 گسستن

**بزدینۆک / bizdînok/**: ناو. مەترسی؛ بڤە؛ خەتەر 🇮🇷 خطر

**بزر / bizr/**: ناو. ڕۆن کەتان 🇮🇷 بَزرَک

**بزر / bizir/**: ئاوەڵناو. برزە؛ بەزر؛ ون؛ گوم؛ بەزرە؛ ونڈا ‹تەماشای شیوەنی من کە ئەخوێنم هەر وەکوو قومری/ برا ئەم شینە بۆ تۆیە کە وا بێ‌جێگە و بزری «قانع»›. هەروەها: **بزر بوون** 🇮🇷 گُم

**بزران / bizran/**: چاوگ. ون بوون؛ گوم بوون 🇮🇷 گُم شدن

**بزراندن / bizrandin/**: چاوگ. ون کردن؛ گوم کردن 🇮🇷 گُم کردن

**بزربو / bizirbû/**: ئاوەڵناو. گوموگۆڕ؛ شرت‌وگوم 🇮🇷 گم‌وگور

**بزرقنای / b(i)zirqnay/**: ☜ **بزرکاندن ـ١**

**بزرقیای** / b(i)zirqyay/: ☜ **بزرکان ـ١**

**بزرک** / b(i)zirk/: ☜ **بزرۆك**

**بزرکان** / bizirkan/: چاوگ. داپچکووران؛ ژاکـان؛ زەرد هەڵگەران ☰ پژمرده شدن

**بزرکنای** / b(i)zirknay/: ☜ **بزرکاندن ـ١**

**بزرکیای** / b(i)zirkyay/: ☜ **بزرکان ـ١**

**بزرۆک** / bizrok/: ناو. بزرک؛ زیپکـەی زۆر ورد ☰ جوش ریز پوستی

**بزرۆکە** / b(i)zroke/: نـاو. *[زمانناسی]* بزۆکـە؛ شـوا؛ دەنگیلەیەکە لە زمانی کوردیدا کە لـە ڕێنووسـی ئارامیـدا دەرناکـەوێ، وەک لـە وشـەی «بـزر»دا هەیە، بەرانبەری «i» لە ڕێنووسی لاتیندا ☰ شوا؛ کسرەی خفیف/ مختلصه

**بزڕ** / b(i)ziř/: ئاوەڵناو. ١. بە گلوو داوەسـتاو؛ بـڕاو (شـیر و ماسـت) ٢. بزگـوڕ؛ تیتـۆڵ ☰ ١. بُریـده (لبنیات) ٢. کُهنه (پارچه)

**بزڕاندن** / bizřandin/: چاوگ. دڕانـدن؛ چڕانـدن؛ دادڕینی کووتاڵ ☰ پاره کردن پارچه

**بزڕ ـ بزڕ** / b(i)ziř b(i)ziř/: ئاوەڵناو. لـەت ـ لـەت؛ کوت ـ کوت؛ تیکه ـ تیکه ☰ تکه ـ تکه

**بزڕکـان** / b(i)zirkan/: چـاوگ. تێنەپەڕ. //بزڕکـای؛ دەبزڕکێـی؛ ببزڕکـێ// بڕسـکان: ١. بزرقیـای؛ بزرکیـای؛ هەڵـگەڕان و تێکچـوونی تەوشـی لـە چەشنی شیر و ماست ٢. *[مەجاز]* ڕەنگ پەڕین لە تـرس یـان ڕک ٣. ترووکـانی چـاو ☰ ١. بریـدن مایعاتی از قبیل شیر و ماست ٢. رنگ باختن ٣. پلـک زدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: بزڕکـاو/ چـاوگی نـەرێنی: نەبزڕکان

**بزڕکاندن** / bizirkandin/: چاوگ. تێپەڕ. //بزڕکانـدت؛ دەبزڕکێنی؛ ببزڕکێنـە// بڕسـکاندن: ١. بزرقنـای؛ بزرکنـای؛ هەڵـگەڕاندنی تـراوی وەکـوو شـیر و ماست ٢. *[مەجاز]* ڕەنگ پەڕانـدن ٣. تروووکانـدنی چاو ٤. *[مەجاز]* ڕاواندن؛ قسـە پەڕانـدن ‹ترسـاوە، قسە دەبزڕکێنێ› ☰ ١. بُریدن لبنیات ٢. ترسـاندن و رنگ باختن ٣. چشم برهم زدن ۴. هذیان گفتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەبزڕکاندن

**بزڕکاو** / bizirkaw/: ئاوەڵـناو. هەڵگەڕاو؛ بڕوسـقیاو (وەک شیر و ...) ☰ بُریده (شیر)

**بزڤان** / bizvan/: چاوگ. جووڵان ☰ تکان خوردن

**بزڤاندن** / bizvandin/: چاوگ. بزوانـدن ☰ تکـانْ دادن

**بزڤین** / bizvîn/: چاوگ. بزووتن ☰ جُنبیدن

**بزک** / bizik/: ناو. مەرجان؛ مرژان ☰ مرجان

**بـزگ** / bizig/: ناو. ١. مووڕووی شـیلانی گەردانـە ٢. پزوو؛ پـزگ؛ جێگـەی دۆخـین ☰ ١. مُهـرەی قرمز زینتی ٢. نیفه

**بزگـوڕ**[1] / bizgur/: نـاو. پارچەیـەکی باریـک لـە قوماشـی کـۆن و ڕزیـو ‹بزگـوڕی ڕەش داپۆشـێ ڕوومەتی گەش، تا بە کەی؟/ شاعیری گەشبینم و کوا چاوی ڕەشبینم دەوێ؟! «هێمن»› ☰ نوار باریـک از پارچەی کهنه

**بزگوڕ**[2]: ئاوەڵناو. کۆنـە؛ لەبەریـەک چـوو ☰ کهنـە؛ فرسوده

**بزگە** / bizge/: ☜ **بزە**[1]

**بزگیر**[1] / bizgîr/: ناو. چێـودار؛ چێـوار. هـەروەها: **بزگیری** ☰ چوبدار

**بزگیـر**[2]: ئاوەڵـناو. ڕژد؛ چکـــووس؛ ســـەقیل؛ دەس‌قووچاو ☰ خسیس

**بزگیلـە** / bizgîle/: نـاو. گزکیلـــە؛ تەماتەجنانـــە؛ بزگیل؛ گولکێ بەران؛ گولا دەرەوین؛ گیایەکە لـە بنەماڵەی تەماتـە و ڕێزڵـە، گـەڵاکانی چەشـنی گەڵای پەتاتەیە، بەرێکی خڕی درێژۆکە و تـۆڕی هەیە، لە ناو تۆڕەکە میوەیـەکی بـسوور و زەردی خڕ دەگرێت کە بۆ دەرمان دەشێ ☰ گیاه کاکنج؛ عروسک پشت پرده

**بزگێله / bizgêle/:** ☜ **بەربوك**

**بزڵماجی / b(i)zilmacî/:** ناو. جۆرێ کولێرەی ساجی ≛ نوعی گرده نان

**بزڵە / bizle/:** ناو. کاژیله؛ کاریله؛ بەچکە بزن ≛ بُزغاله

**بزماتە / bizmate/:** ☜ **بەزمەتە**[1]

**بزمار / bizmar/:** ناو. بسمار؛ مێخ ‹بزماری بە بەردا ناچێ «مەسەل»› ≛ میخ

▣ **بزمار بە گا:** *[مەجاز]* شوێنی تەنگەبەر و شلۆق ≛ جای تنگ و پرجمعیت

**بزمارڕێز / bizmařêz/:** ☜ **بزمارڕێژ**

**بزمارڕێژ / bizmařêj/:** ئاوەڵناو. بزمارڕێز؛ بە بزمار قایمکراو ≛ میخکوب

**بزمارکوت[1] / bizmarkut/:** ناو. ١. مێخکوت؛ کەرستەی لێدانی بزمار و سنجاخ بۆ لێک توند کردنی دوو یان چەند شت پێکەوە ٢. جۆرێ هێشووە تریی پڕ و تێکپەستواو ≛ ١. میخکوب ٢. خوشەی متراکم انگور

**بزمارکوت[2]:** ئاوەڵناو. بزمارڕێژ؛ مێخڕێژ؛ سنجاخڕێژ؛ بە بزمار یان سنجاخ قایمکراو ≛ میخکوب

**بزمارۆک / bizmarok/:** ناو. بزماتە؛ بزمەتە؛ بزمارە؛ بسمارە؛ مسمار؛ بسمارک؛ کەنگرۆشک؛ کەنگرۆک؛ مێخەکە؛ مێخچە؛ نیخچک؛ پۆرگی ڕووش و ئەستووری سەر پێست کە بە هۆی زۆر کوتانەوەی شوێنێک لە پێست، بەتایبەت لە ژێر پێ و لەپی دەست و لە سەر قامکی دەست و پێدا بەدی دێ ≛ میخچە

**بزمارە / bizmare/:** ناو. ١. بزماری دارین کە کون و کەلێنی دۆلاشی پێ‌دەگرن ٢. بزمارۆک ≛ ١. میخ چوبین ناوبند آسیا ٢. میخچە

**بزمژنەک / bizmijnek/:** ☜ **بزنمژە**

**بزمک / bizmik/:** ☜ **بزمۆك**

**بزمۆک / bizmok/:** ناو. بزمک؛ بزمووک؛ بزمەک؛ بلامک؛ بلەموو؛ زاربێن؛ دمبێنی لە داری بێچووی ئاژاڵ تا نەتوانێ شیری دایکی بمژێ ≛ پوزەبند

**بزموک / bizmûk/:** ☜ **بزمۆك**

**بزمەتە / bizmete/:** ☜ **بزمەتە**[1]

**بزمەک / bizmek/:** ☜ **بزمۆك**

**بزن / b(i)zin/:** ناو. بز؛ بزە؛ بس؛ بوز؛ بوزە؛ کیەر؛ کییەر؛ گدە؛ گدێ؛ کەگە؛ کەهری؛ سیان؛ سێونگ؛ سیاونە؛ ڕەشانگ؛ تیشک؛ تووشتیرە؛ گیانەوەری گوانداری دەسەمۆ کە مرۆ لە شیر و گۆشت و پێستی کەڵک دەبا ≛ بُز

**بزنانە / b(i)zinane/:** ناو. پیتاکی سەرانەی بزن بۆ میری ≛ باج و سرانەی بُز

**بزنترێنە / b(i)zintiřêne/:** ناو. گیایەکە لە کەوەر ئەکا و سەڵکی هەیە ≛ گیاهی شبیه تره

**بزنچەکێنە / b(i)zinçekêne/:** ناو. بزنمژ؛ بزنمژک؛ تیرتیرە ≛ بزمچە

**بزنگرە / b(i)zing(i)re/:** ناو. جۆرێ دڕکە لە کونجرە گەورەتر، بە مەڕ و بزنەوە دەنووسێ ≛ نوعی خار

**بزنلەر / b(i)zinler/:** ناو. شاوە؛ باڵدارێکە بۆر بە قەد قازە و گۆشتی ئەخورێ ≛ حواصیل

**بزنمژ / b(i)zinmij/:** ☜ **بزنمژە**

**بزنمژک / b(i)zinmijik/:** ☜ **بزنمژە**

**بزنمژە / b(i)zinm(i)je/:** ناو. بزنمژ؛ بزمژنەک؛ بزنمشک؛ بزنمژک؛ فاتفاتک؛ قۆژیانە؛ حوبێ؛ کەلپەزی؛ بێرەبێرە ≛ بُزمجە

**بزنمشک / b(i)zinmişk/:** ☜ **بزنمژە**

**بزنەدۆخە / b(i)zinedoxe/:** ناو. بزنێ کە دەدرێ بە ئاغا دۆی بخوا ≛ بُزی کە بهرەاش را ارباب می‌برد

**بزنەڕیشە / biz(i)neřîşe/:** ناو. گیایەکی وەک ڕیشی بزنە لە شوێت ئەکا و سەڵکی هەیە ≛ گیاهی است

**بزنەڕێ** / b(i)zineřê/: ناو. ڕێگای زۆر باریک و ناخۆش ⚑ راه سخت و سنگلاخی

**بزنەکێفی** / b(i)zinekêfî/: ☚ **بزنەکێوی**

**بزنەکێوی** / b(i)zinekêwî/: ناو. بزنەکێفی؛ کۆوی؛ کۆڤی؛ شقن؛ کەڵ؛ پازن؛ کەڵەکێوی؛ بزەنەچیر؛ بزنە هەردی ⚑ بُز کوهی

**بزنەمەرەز** / b(i)zinemerez/: ناو. بزەمەرەزێ؛ ڕەگەزی ڕەسەنی بزنی کەون و کەویی کوردەواری کە بەرگی لە مەرەزی گیراوە (ڕوون کردنەوە: بزنی ئانقۆرە کە نێوبانگی لە دنیادا دەرکردووە، بەرەی ئەم دواییەی بزنەمەرەزەی کوردستانە) ⚑ بُز مَرخوز، بومی کردستان که از کُرک آن موهر و ... به دست می‌آید

**بزنەمەرەزێ** / b(i)zinemerezê/: ☚ **بزنەمەرەز**

**بزنەمەڕ** / biznemeř/: ناو. چیر؛ بزنەمەڕەز ⚑ بز مرغز

**بزنەوەس** / biz(i)newes/: ناو. مەشکەی بزن ⚑ مَشک از پوست بُز

**بزنیقازی** / bizniqazî/: ناو. گەمەیەکی لاوانە، قوتووە شەمچەیەک دادەنێن هەر کەس بتوانێ لە سەر لاق و دوو قوڵەدار بە گاگۆلکێ بڕوا و بە دەم هەڵیگرێ، بەرەندەیە ⚑ نوعی بازی قدیمی جوانان

**بزنیری** / biznêrî/: ناو. گیایەکە بۆ لەوەڕ دەبێ ⚑ گیاهی چراگاهی

**بزوان** / bizwan/: چاوگ. تێنەپەر. //بزوای؛ دەبزوێی؛ ببزوە// جووڵان؛ جووڵیان (مەبزوە مەحویا لەم ڕێگەدا تا دەبییە خاکی ڕێ/ ئومیدە دەستی گەردت هەر دەگا ئاخر بە داوێنی «مەحوی») ⚑ تکان خوردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: بزواو/ چاوگی نەرێنی: نەبزوان

**بزواندن** / bizwandin/: چاوگ. تێپەڕ. //بزواندت؛ دەبزوێنی؛ ببزوێنە// بزوێندن: ١. جووڵاندن؛ تل پێ دان (وەک چۆن نەونەمامێ گەردەلوول ئەیبات و ئەیهێنێ/ لەشم مووچڕکی دڵداری وەها ناخی ئەبزوێنێ «ئاوات») ٢. دنەدان؛ هەڵخڕاندن ⚑ ١. جنباندن ٢. برانگیختن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: -/ چاوگی نەرێنی: نەبزواندن

**بزواندنەوە** / bizwandinewe/: چاوگ. جووڵاندنەوە؛ جمەوجووڵ پێ خستنەوە ⚑ تحرک بخشیدن

**بزوێن**[١] / bizwên/: ناو. ١. [ڕێنووس] نیشانەی تایبەتی هێندێک پیت لە ڕێنووسی زمانی کوردیدا (وەک: ڕ، ڵ، ۆ، ێ) ٢. [ڕێزمان] پیتی دەنگدار (وەک: ا، ۆ، و، وو، ی، ێ، یی، ە) ⚑ ١. نشانەی ویژەی برخی حروف در رسم‌الخط زبان کردی ٢. مصوت؛ واکه؛ حرف صدادار

**- بزوێن**[٢]: پاشەوشە. وە بزاو هێنەر؛ وە جووڵەخەر (دڵبزوێن؛ هەستبزوێن؛ وەک شەراب بگەڕێ لە خوێن/ خەمڕەوێن بێ و نەشەبزوێن «هێمن») ⚑ - انگیز؛ مُحرک

**بزوێندن** / bizwêndin/: ☚ **بزواندن**

**بزۆت** / b(i)zot/: ☚ **بسۆت**

**بزۆر** / b(i)zor/: ئاوەڵناو. ژانکردوو؛ بێئارام ⚑ بی‌قرار

**بزۆز** / b(i)zoz/: ئاوەڵناو. بزێو؛ بێئۆقرە؛ هەر لە گەڕاندا (لە جێژوانێ خۆم ڕادەگرت/ میزم بە بزۆزاندا دەگرت «هێمن») ⚑ پرجنب‌وجوش

**بزۆق** / bizoq/: ناو. بسۆخ: ١. هەڵبەزدابەز ٢. تەمبوور ⚑ ١. ورجه‌ورجه ٢. تنبور

**بزۆک** / bizok/: ئاوەڵناو. ١. جووڵەر؛ جووڵێنە؛ بزۆز؛ بزێو؛ بەتایبەتمەندی جووڵانەوە ٢. زۆر بە زگ و زا ٣. زگ‌کەر؛ دژی نەزۆک ⚑ ١. متحرک ٢. زایا ٣. زاینده

**بزۆکە** / b(i)zoke/: ☚ **بزرۆکە**

**بزوو** / b(i)zû/: ناو. ١. جۆرێ دار بی ٢. بنی کلکی یەکسم ⚑ ١. نوعی درخت بید ٢. زیر دم

ستور

**بزووت** / b(i)zût/: ناو. بزووتک؛ بسۆت؛ سەرەبزۆت؛ چیلکە و داری سەر بە ئاگر ‹یا ڕەب لە دۆزەخ ئوممەتی ئەحمەد بدەی نەجات/ کەم بێ چییە لە کوورەیێ وا، باوەشێ بزووت «مەحوی»› ☰ نیمسوز

**بزووتک** / b(i)zûtik/: ☜ **بزووت**

**بزووتن** / b(i)zûtin/: چاوگ. تێنەپەڕ. //بزووتی؛ دەبزووی؛ ببزوو// بزەفتن: ۱. جووڵان؛ جووڵیان ‹تا هەوری بەهاری نەبزووت غونچە نەپشکووت/ بۆیە دەگری خەندە بەسەر گریەیی مندا «وەفایی»› ۲. هاتنە ڕەگا؛ تک ـ تک هاتنە خوارەوەی هەر جۆرە تراوێ، بەتایبەت شیر لە مەمکی دایک بە بێ دۆشین ☰ ۱. جُنبیدن ۲. ریختن خودبخودی مایع

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: بزووتوو/ چاوگی نەرێنی: نەبزووتن

**بزووتنەوە**[1] / b(i)zût(i)newe/: چاوگ. تێنەپەڕ. //بزووتیەوە؛ دەبزوویەوە؛ ببزووەوە// جووڵانەوە؛ جووڵان؛ جووڵیان ‹کە نەبزووتمەوە ئەو جیرەی ئەهات/ بەو جیرە ـ جیرە کەوتمە ئاوات! «هەژار، بۆ کوردستان»› ☰ جُنبیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: بزووتووەوە/ چاوگی نەرێنی: نەبزووتنەوە

**بزووتنەوە**[2]: ناو. شۆڕش؛ سەرهەڵدان ☰ قیام؛ جنبش سیاسی

**بزووتوو** / b(i)zûtû/: ☜ **بزاوتوو**

**بزووک** / b(i)zûk/: ئاوەڵناو. ۱. زیرەک ۲. بزۆز؛ پرجووڵە ☰ ۱. زرنگ ۲. پرجنب‌وجوش

**بزە** / b(i)ze/: ناو. ۱. بزگە؛ بسکە؛ بزەخەنگ؛ زەردە؛ خەنە؛ زەردەخەنە؛ زەردەخۆ؛ زەردەکەنی؛ لچ‌خەنە؛ دزەخەنە؛ لێوەخەنە؛ برینجە؛ لێڤ‌کەنی؛ گرنژ؛ پێکەنینی وا کە تەنیا لێو دەبزوێ ‹بزەی شیرینی سەر لێوێ/ هەستی پیرانەم دەبزێوێ «هێمن»› ۲. ☜ **بزن** ۳. کاری زەق تواشا کردن ☰ ۱. لبخند ۲. ☜ **بزن** ۳. نگاه خیره

⊡ **بزە لێ کردن**: بە بۆنەیەکەوە بزە هاتن ☰ بە چیزی لبخند زدن

**بزە هاتن**: بزە کەوتنە سەر لێوانەوە ‹بزەت نایێتە سەر لێو و بەزەت نایە بە حاڵمدا/ ئەگەرچی زۆر لەمێژ ساڵە لە دووت دەخشێم وەکوو سایە «هێمن»› ☰ لبخند به لب دویدن

**بزەباقە** / b(i)zebaqe/: ناو. بەلەباقە؛ باقەبزن؛ نەخۆشییەکی بزنە ☰ نوعی بیماری بُز

**بزەبز** / b(i)zebiz/: ئاوەڵکار. زەق؛ زەق ـ زەق؛ دۆخی تێوە ڕامان ‹بزەبز لێم دەڕوانێ!› ☰ خیره

**بزەخەنگ** / b(i)zexenig/: ☜ **بزە**

**بزەفتن** / b(i)zeftin/: ☜ **بزووتن**

**بزەلەر** / b(i)zeler/: ☜ **بزەلەڕە**

**بزەلەڕە** / b(i)zeleře/: ناو. بزەلەر؛ شاوە؛ شاڤ؛ ماسی‌خۆرە؛ ناوی چەن جۆر باڵندەیە کە لە قەراخی ئاودا دەژین ☰ حواصیل

**بزەڵە** / b(i)zeɫe/: ناو. باقۆڵە؛ بەچکە بەراز؛ کوودەڵەبەراز ☰ بچه خوک

**بزەمبزەم** / b(i)zemb(i)zem/: ناو. تەنتەنە؛ سەنسەنە؛ جەلال و شکۆ ☰ جلال و شکوه

**بزەمەرەزێ** / b(i)zemerezê/: ☜ **بزنەمەرەز**

**بزەنەچیر** / b(i)zeneçîr/: ☜ **بزنەکێوی**

**بزی** / b(i)zî/: ناو. بەزەیی ☰ رحم؛ شفقت

**بزیسک** / b(i)zîsk/: ناو. پزیسکە؛ ئاورنگ؛ ئاورینگ؛ پریشکەی ئاگر ☰ شراره؛ اخگر

**بزێ** / b(i)zê/: ناو. بەرکەڵ؛ دامنەچەقان؛ نوهگوان؛ چێلی سێ بەهار دیتوو ☰ تلیسه

**بزێن** / b(i)zên/: ناو. گەمەی جەغزێن ☰ نوعی بازی

**بزێو**[1] / bizêw/: ئاوەڵناو. ۱. بزۆز؛ بزۆک؛ نەوێستاو؛ پرجم‌وجووڵ ‹موتیعی ئەمر و نەهیی ئەو، مولووکی سەرکەش و بزێو/ ئەسیری قەهر و لوتفی ئەو، سیباع

و وەحشی دەشت و کێو «بێخود»› ٢. زرک و زینگ ف ١. پرجنبوجوش؛ سرکش ٢. زرنگ

**- بزێو**[2]: پاشرشە. ١. وە جووڵەهێن ‹بن‌بزێو› ٢. نەسرەوتە ‹سەربزێو؛ دەزبزێو› ف ١. ـ انگیز ٢. ـ انگیخته

**بزێوی** / b(i)zêwî/: ناو. وشیاری؛ وریایی ف هُشیاری

**بژ**[1] / bij/: ناو. ١. یاڵ؛ تووکی ملی یەکسم و شێر ٢. کاکۆڵ ٣. پارچە؛ پاژ؛ لەتک ٤. خواست؛ داوا ف ١. یال ٢. کاکل ٣. جزء ۴. خواهش

**بژ**[2]: ئاوڵناو. گرژ؛ کرژ؛ ڕاست وەستاو لە ترس یان لە سەیران (موو) ف سیخ شده (مو)

⊡ **بژ وێستان**: ڕاست و کرژ بوونەوەی مووی لەش، لە ترس یان لە سەیران ف سیخ شدن موی بدن

**بژ**[3]: ئامراز. جگە؛ بل؛ غەیرەز ف جُز

**بژار**[1] / b(i)jar/: ناو. ١. بژاڵ؛ فرس؛ هەرێز؛ هەرێس؛ هەڵیس؛ هەلیز؛ ئالاخ؛ هەژاڵە؛ فریز؛ فریزوو؛ فرێز؛ فرووزوو؛ فرووزی؛ گیاهەرزە؛ کەڵە؛ کێرکەڵە؛ گیای بێ‌کەڵک و خراپ لە ناو زەرعات کە دەبێ لا ببرێ ‹نۆرەی پشک و بژاربڕە/ جەرگبڕە، بژار پڕە «مەلا ئاوارە»› ٢. بژارە؛ ئادە؛ ئاویە؛ کاخ؛ وجێس؛ خەپار؛ کشکە؛ سلمتە؛ حەپارە؛ کاژەنگ؛ وجێز؛ وجز؛ وژن؛ ناوەژیە؛ کاری خاوێن کردنەوەی مەزرا لە گژ و گیای خۆڕسکی بێ‌کەڵک ‹بێستان بژاری دەوێ «مەسەل»› ٣. دانەی بێگانە لە ناو دانەوێڵەدا ٤. کاری خۆ دۆزین ٥. ژمار؛ ژمارە ‹گوێزت بە بژار دەدەمێ› ٦. کاری هەڵبژاردن ٧. /*کینایە*/ مرۆی خوێری و خۆفرۆش ‹نیشتمان پاشی فڕێ دانی بژار/ پاشی پەی کردنی دەستی زۆردار «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ف ١. علف هرز ٢. وجین ٣. دانەی نُخاله در غلّه ۴. عمل خود جُستن ۵. شماره ۶ انتخاب ۷. خودفروش

⊡ **بژار کردن**: ١. گیای بێ‌کەڵک هەڵکەندن و فڕێ دان ٢. خۆ دۆزین ف ١. وجین کردن ٢. خود جُستن

**بژار**[2]: ئاوەڵناو. دەگمە؛ دەگمەن؛ نایاب؛ کەموێنە ‹بەڵێ وایە، کانی هەژارن/ ئەزانم ئەوانەی کە پاراوی ئاون، بژارن «سوارە»› ف نادر

**بژاربڕ** / b(i)jarbiř/: ☚ **بژارچن**

**بژارتن** / b(i)jartin/: چاوگ. ١. پاک کردنی دانەوێڵە لە زیوان و شتی نایاب ٢. ژماردن ٣. برژاندن ف ١. پاک کردن غلات ٢. شمردن ٣. برشتن

**بژارتوو** / b(i)jartû/: ئاوەڵناو. ١. ژماردە؛ ژمارەکراو ٢. بژێردراو؛ تەقیاو ٣. هەڵبژێردراو ف ١. شمارش‌شده ٢. پاک‌شده ٣. برگزیده

**بژارتی** / b(i)jartî/: ئاوەڵناو. ١. برژاو ٢. بژێردراو ٣. ژمێردراو ٤. هەڵبژێردراو ف ١. بریان‌شده ٢. پاک‌شده ٣. شمارش‌شده ۴. انتخاب‌شده

**بژارچن** / b(i)jarçin/: ناو. بژاربڕ؛ ئاسنۆکێکی کلکداری دەم‌پانە کە گیای بژاری پێ‌هەڵدەکەنن ف بیلک وجین

**بژارچی** / b(i)jarçî/: ناو. وژنکەر؛ ئەو کەسە بژار دەکا ف آنکه وجین می‌کند

**بژاردن** / b(i)jardin/: چاوگ. تێپەڕ. //بژاردت؛ دەبژێری؛ ببژێرە// ١. ژماردن؛ شماردن ‹قەیسەر هەچی بووی لە زێڕ و زیوان/ زۆرتر لە بژاردن و لە پێوان «هەژار، *مەم و زین*»› ٢. تەقاندن؛ چاک لە خراپ جیا کردنەوە ٣. تاوان دان ف ١. شُمُردن ٢. برگُزیدن ٣. تاوان دادن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: بژاردوو/ چاوگی نەرێنی: نەبژاردن

**بژاردنەوە** / b(i)jard(i)newe/: ☚ **بژارنەوە**

**بژارده** / b(i)jarde/: ئاوەڵناو. ١. کەموێنە ٢. ژمێردراو ٣. هەڵبژارده ‹تۆ لاوی بژارده، مەم! لە ناوا/ هەر خۆت ببە ئاریکاری زاوا «هەژار، *مەم و زین*»› ٤. ناوازە؛ خاوەن تایبەتمەندی جیاواز ف

١. کم‌نظیر ٢. شمرده شده ٣. مُنتخب ۴. مُتمایز

**بژارکەر** / b(i)jarker/: ناو. کەسێ کە بژار دەکا ☰ وجینکار

**بژارنەوە** / b(i)jarnewe/: ناو. بژاردنەوە: ١. خەون گێڕانەوە ٢. دووبارە هەژماردن ☰ ١. بازگو کردن خواب ٢. باز شمردن

**بژارە**[١] / b(i)jare/: ناو. ١. بژار؛ کاری خاوێن کردنەوەی مەزرا لە گژ و گیای خۆڕسکی بێ‌کەڵک ٢. تاوان؛ سەوس؛ خورۆمە ٣. پاچڤە؛ کاری وەرگێڕان ٤. کار و ڕەوتی ڕاستەوپاستە کردنی ڕایەڵ کە جۆلا ئەیکا ٥. خەیالاتی خەوزڕاو ٦. کاری خەو لێکدانەوە ٧. تەڵ؛ هەرکام لەو ڕێگا یان چارانە کە بۆ هەڵبژاردن دەبێ ☰ ١. وجین ٢. تاوان ٣. ترجمە ۴. عمل تارە کشیدن جولایی ۵. خیالات خواب‌آشوب ۶ تعبیر خواب ٧. گُزینه

**بژارە**[٢]: ناوەڵناو. ١. بژاردە؛ هەڵکەوتە؛ هەڵکەوتوو ‹ژ ئێلا خوە حەفتسەد سوارێ بژارە بەرهەڤ کر «مەلا مەحموودی بایەزیدی»› ٢. خۆشەویست؛ ئازیز ☰ ١. مُمتاز ٢. گرامی

**بژاڵ** / b(i)jał/: ناو. ١. هەلاش؛ چرپی و پووشێ کە بە سەر میچیدا ئەدەن ٢. ☜ **بژار**[١]**ـ١** ٣. پرژ و بلاوی؛ پەرێشانی ☰ ١. خلاشە ٢. ☜ **بژار**[١]**ـ١** ٣. تشویش؛ آشفتگی

**بژاندن** / b(i)jandin/: چاوگ. ئیشتیا و هەوەس کردن ☰ هوس کردن

**بژانک** / b(i)jank/: ناو. کەرەستەی خۆ ڕازاندنەوەی ژنان ☰ لوازم آرایشی زنان

**بژانگ** / b(i)jang/: ناو. ١. برژانگ؛ مژۆڵ ‹ئەبروو چ؟ کەوانی بێ‌گرێ و ڕێک/ پەیکانی بژانگ چ؟ تیری دلپێک «هەژار، *مەم و زین*»› ٢. پرزە و ڕیشاڵی کووتاڵ ٣. ڕیشاڵی گوڵی دەخڵ ☰ ١. مُژە ٢. پُرز پارچە ٣. پُرز خوشەی غلات

**بژانن** / b(i)janin/: چاوگ. ١. هەڵبژاردن؛ نەقاندن ٢. برژاندن ☰ ١. انتخاب کردن ٢. برشتن

**بژ بژ** / bij bij/: ناوەڵکار. پاژ- پاژ؛ پارچە ـ پارچە ☰ قطعه ـ قطعه

**بژبژۆکە** / bijb(i)joke/: ناو. ناوی گیایەکە گوڵی سوور دەکا ☰ گیاهی با گل‌های قرمز

**بژبژە** / bijb(i)je/: ناو. هەڵەپەزە؛ پەسپەسەکۆڵە ☰ رُطیل

**بژشکیار** / b(i)jişkyar/: ☜ **بژیشکیار**

**بژکین** / bijkîn/: چاوگ. بلاو بوون؛ پرژان ☰ پراکندن

**بژگە** / bijge/: ناو. پرشنگ؛ پریشکی ئاو و ... ☰ پشنگ آب

**بژل** / bijil/: ئامراز. بەجگە؛ بێجگە؛ بل؛ بە غەیرەز ☰ بجُز

**بژلی** / bijlî/: ئامراز. بژل ☰ بجُز

**بژمێر** / bijmêr/: ناو. ژمێریار؛ حیسابگەر ☰ حسابدار

**بژن** / bijin/: ناوەڵناو. ١. قژن؛ قژنەسەر ٢. ژندار ☰ ١. ژولیده‌مو ٢. مُتأهل (مرد)

**بژنگ** / bijing/: ناو. پریشک؛ پریشکەی ئاو یان ئاگر ☰ پَشنگ

**بژنیاگ** / bijinyag/: ناوەڵناو. بژاردە؛ هەڵبژاردە؛ نەقاندی ☰ مُنتخب

**بژنین** / bijnîn/: چاوگ. ١. چنینەوە؛ هەڵگرتن ٢. خۆ دۆزین؛ خۆ پشکنین بۆ زیندوو ٣. دانەوێڵە بژارتن ٤. هەڵبژاردن ☰ ١. برچیدن ٢. خودجستن ٣. پاک کردن غله؛ وجین کردن ۴. انتخاب کردن

**بژوار** / bijwar/: ☜ **بژوێن**[١]

**بژوێن**[١] / bijwên/: ناو. بژوون؛ زەمەند؛ زەوی پڕ گیا و لەوەڕ ‹گەڕاوم چۆم و نواڵە و مێرگ و بژوێن/ بە ماه و زەردی ئەستەم هەڵگەڕاوم «هێمن»› ☰ زمین پر گیاه و علف

**بژوێن²**: ئاوەڵناو. بژوون؛ پڕگیا و لەوەڕ ‹شاعیرم، جوانیپەرستم، دڵتەڕم، شێتم لە شەوق/ کێوی بژوێن، دیمەنی جوان، دەشتی ڕەنگینم دەوێ «هێمن»› ≡ پُرگیاه و علف

**بژۆک** / b(i)jok/: ناو. واز؛ ئارەزوو؛ ئیشتیا ≡ اشتها

**بژۆلک** / b(i)jolk/: ☜ برژانگ

**بژۆڵ** / b(i)joł/: ناو. مژۆڵ؛ مژان؛ برژانگ ‹بە داوی کەزییەکەت دڵ دالەقاوە/ بژۆڵت ڕیزەنیزەی تێ چەقاوە! «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ≡ مُژه

**بژۆن¹** / b(i)jon/: ناو. ١. ورە؛ هێز؛ توانایی ٢. ☜ برژانگ ≡ ١. توانایی ٢. ☜ برژانگ

**بژۆن²**: ئاوەڵناو. جوانخاس؛ قۆز؛ پێکەوتوو ≡ خوشکل

**بژوو** / b(i)jû/: ناو. بژ؛ یالی ئەسپ ≡ یال

**بژوولک** / bijûłk/: ☜ برژانگ

**بژوون¹** / b(i)jûn/: ناو. ١. ☜ **بژوێن¹** ٢. سووژن؛ شووژن ≡ ١. ☜ **بژوێن¹** ٢. جوالدوز

**بژوون²**: ئاوەڵناو. ١. ☜ **بژوێن²** ٢. پۆشتە و پەرداخ؛ تەڕپۆش ٣. ئازا؛ جوامێر ٤. پاک و خاوێن ≡ ١. ☜ **بژوێن²** ٢. شیک‌پوش ٣. دلیر ۴. پاک؛ تمیز

**بژوونی** / b(i)jûnî/: ناو. پاکی و خاوێنی لەش ≡ پاکیزگی

**بژە¹** / b(i)je/: ناو. هەنگوینێک کە پاش بڕینەوەی کەندوو بۆ ژیواری هەنگ دەمێنێتەوە ≡ عسل مانده در کندو

**بژە²**: ئاوەڵناو. زۆرزان ≡ عیّار

**بژەن** / b(i)jen/: ناو. کلۆم؛ کێلوون؛ کەلوون؛ کلیل و گۆڵە ≡ قفل و کلید چوبی

**بژی¹** / b(i)jî/: ناو. ١. فڕ؛ گودلە؛ کاکۆڵی سەر هەنیە ٢. یاڵ؛ پرووز؛ تیسکی سەر مل و سینگی بڕێ گیانەوەر (وەک ئەسپ و شێر) ٣. بەژ؛ وشکایی؛ وشکانی ٤. ڕەشی ≡ ١. زلف ٢. یال ٣. خشکی ۴. سیاهی

**بژی²**: سارستە. ١. نەمری؛ وشەی ڕێز ‹بژی کورد و کوردستان› ٢. نەمرێ؛ هەر بمێنێ ≡ ١و٢. زنده‌باد

**بژیاگ** / bijyag/: ئاوەڵناو. هەڵبژاردە؛ بژاردە ≡ انتخاب شده

**بژیان** / bijyan/: چاوگ. ١. پژان؛ بڵاو بوون؛ پەرژ بوون؛ پرژان ٢. ئارەزوو کردن ≡ ١. پراکنده شدن ٢. آرزو کردن؛ خواستن

**بژیر¹** / b(i)jîr/: ناو. بژار ≡ علف هرز

**بژیر²**: ئاوەڵناو. زیرەک؛ وریا ≡ زیرک

**بژیشک** / b(i)jîşk/: ناو. پزیشک؛ پسیزک؛ پزیسک؛ دوکتور؛ ئەوەی لە زانکۆی بژیشکی، بڕوانامەی دوکتوری وەرگرتبێ و دەرمانی نەخۆش بکات ‹ناڵە و هاواری خستە هەر لایە/ بژیشکێ گوتی دەرمانت بایە «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ≡ پزشک

**بژیشکی** / b(i)jîşkî/: ناو. پزیشکی ≡ پزشکی

**بژیشکیار** / b(i)jîşkyar/: ناو. پزیشکیار؛ بژشکیار؛ هاریکاری پزیشک ≡ پزشکیار

**بژیک** / b(i)jîk/: ئاوەڵناو. خۆژی؛ خۆژیو؛ بژیو؛ بێ نیاز و پێداویستی بە یارمەتی ≡ خودزیست

**بژیو¹** / b(i)jîw/: ناو. بژێو؛ مایەی ژیان ‹باسکی من و تیشکی ئەوی/ بژیو دەستێنن لە زەوی «هێمن»› ≡ قوت؛ مایه‌ی زندگی

⊡ **بژیو کردن**: دەربڕدن؛ دەرەقەتی سەختی و سەخڵەتی ژیان هاتن ‹بەم سەرما و سۆڵە، لەم ماڵە بژیو ناکەین› ≡ تاب زندگی آوردن

**بژیو²**: ئاوەڵناو. ١. ☜ **بژیک** ٢. گیانبەخش؛ بەخشێنەر یان هۆی درێژەی ژیان ≡ ١. ☜ **بژیک** ٢. حیات‌بخش

**بژی(و)مەمر** / b(i)jî (w) memir/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* نەمرنەژی؛ نەقرنەپڕ؛ باری ژیانی زۆر ساکار و هەژارانە ≡ بخور و نمیر

**بژیوی / b(i)jîwî/**: ناو. پێداویستی ژیان؛ ئارد و دانەوێڵە و ئازووخەی ماڵ ☰ آذوقه

• **بژێر / b(i)jêr-/**: پاشەوشە. ١. ـ چین؛ ـ هەڵچن ‹گوڵبژێر› ٢. ـ ژمێر؛ ـ ژمارەکەر ‹چیای زاگرۆسە، زورگ و بەردەلانە/ فەلەک نەیکرد و نایکا بەردبژێری «هێمن»› ☰ ١. ـ گزین ٢. ـ شُمار

**بژێران / bijêran/**: ☜ **هەڵبژێران**

**بژێردران / bijêrdran/**: ☜ **هەڵبژێران**

**بژێردراو / b(i)jêrd(i)raw/**: ناوەڵناو. ١. بژاردوو؛ تەقیاو ٢. ئەژمارده؛ ژمارده ☰ ١. پاکشده ٢. شمرده

**بژێلک / bijêlk/**: ☜ **برژانگ**

**بژێن / b(i)jên/**: ناوەڵناو. ژیاندەر ☰ زندگی‌بخش

**بژێو / bijêw/**: ☜ **بژیو**[1]

**بس / bis/**: ☜ **بست ـ١**

**بسات / b(i)sat/**: ناو. بیسات: ١. شتومەکی پێویست بۆ ڕێخستنی کاری میوانی یان زەماوەن ‹باوەرە بسات تەمام تەیار کەر/ شەوخەفتەنی شووم بە زاری مار کەر «مەولەوی»› ٢. شتومەکی سەر عەرەبانەی چەرچی ☰ ١. بساط مهمانی ٢. بساط دستفروش

**بساز / bisaz/**: ناوەڵناو. ١. چێکەر؛ دروستکەر ٢. ساچێن؛ سازیار ☰ ١. سازنده ٢. سازگار

**بسبسۆک / bisb(i)sok/**: ناو. گوڵەستێرە؛ گوەستێرە ☰ کرم شبتاب

**بست / bist/**: ناو. بوست: ١. بس؛ بنگس؛ بنگوس؛ بنگوست؛ بنگست؛ بنگێس؛ بۆس؛ بۆست؛ بوهوست؛ بنگووس؛ بنست؛ بهۆست؛ بهوست؛ بنگز؛ بۆس؛ بنگێس؛ بلسک؛ یەسە؛ گێر؛ گەر؛ وەژە؛ ویژە؛ وژە؛ یەکەی درێژایی کە دەکاتە سەری قامکە گەورە تا سەری تووتە، بە بڵاوی، دەوری ٢٥ سانتی‌میتر ٢. بستە؛ ئاسنی نێوان تەوەرە و بەرداش ☰ ١. وجب ٢. قطب آسیاب

**بستام / bistam/**: ناو. مەرجان؛ مرژان ☰ مرجان

**بستک / bistik/**: ناو. ١. بستەی ئاش ٢. بستەی سەر تەندوور ☰ ١. قطب آسیاب ٢. سیخ تنور

**بستۆک / bistok/**: ☜ **بستو**

**بستۆکە / bistoke/**: ناو. ١. ئەستێولک؛ پارچە ئاسنی سەر تەنوور ٢. بستی گچکە ‹تۆی لە من ون کرد و منی لە تۆ دوور/ ئەو بستۆکەی دوژمن ناوی نا سنوور «هێمن»› ☰ ١. سرپوش فلزی تنور ٢. وجب کوچک

**بستۆگە / bistoge/**: ناو. کووپەڵە؛ کووپەی چکۆلە ☰ بستوغه

**بستو / bistû/**: ناو. بستۆک؛ بستووک: ١. ملەی کێو ٢. بستی ئاش؛ بستەی ئاسیاو ‹نیوەشەو گەر دەرکەوێ وەک ماهی سەر کەڵ تەلعەتی/ وا دەزانن ئافتاب و موشتەری سەر بستووە «حاجی قادر»› ☰ ١. گردنه ٢. قطب آسیاب

**بستوک / bistûk/**: ☜ **بستو**

**بستوگە / bistûge/**: ناو. کووپەڵە؛ کووپەی چکۆلە ☰ بستو؛ خُم کوچک

**بستە[1] / biste/**: ناو. ١. ئاسنی نێوان گەرووی دوو بەرداش ٢. ئاسنی سەر تەنوور و ئاورگ ٣. پسە؛ پستە؛ فستق ٤. چەقەنە بە دەست ٥. لقێکی باریکی پێچ‌پێچە بە سەر لقی برکەبێستانەوە کە لە گژ و گیای تر دەهاڵێ ☰ ١. قطب آسیاب ٢. سیخ تنور ٣. پسته ٤. بشکن ٥. شاخەی پیچ ـپیچ بوتەی جالیز

⊡ **بستە لێدان:** چەقەنە لێدان؛ پل تەقانن؛ تەقە لە پتە هێنان ☰ بشکن زدن

**بستە[2]:** ناوەڵناو. ١. گوێنەدەر؛ بێ‌پەروا ٢. بەفیز؛ لووتبەرز ٣. ئازاد؛ سەربەست ☰ ١. بی‌پروا ٢. مُتکبر ٣. آزاد

**بستەباڵا / bistebała/**: ☜ **باواقۆرەت**

**بستیک / bistîk/**: ناو. زەنگە تریێ؛ تیسک؛

هێشوولکە لە هێشوو 🇮🇷 تلسک انگور

**بستێن** / bistên/: ناو. کڕیار؛ بسێن 🇮🇷 خریدار

**بسک** / bisk/: ناو. ۱. ئەگریجە؛ زوڵف؛ مووی سەر لاجانگ ‹مانگ ئەگەر تیشکی بدا، ڕێنوێنە/ شنەبا بسک و کەزیبزوێنە «هەژار، مەم و زین»› ۲. پرزەی سەر بەرگی گەنمەشامی ۳. کولانەی مریشک ٤. باڵەخانە؛ کۆشک 🇮🇷 ۱. زلف ۲. کاکُل ذرت ۳. لانەی مُرغ ۴. کاخ

◘ **بسک دان**: لێبوونەوەی کاڵەک و گرکە لە بەر زۆر گەیشتن ‹بێسانەکە بسکی دابوو› 🇮🇷 جدا شدن میوەی جالیزی از بوتەاش بە دلیل پیر شدن

**بسکوجاخ** / bisk û cax/: ناو. زوڵف و ئەگریجە 🇮🇷 زلف

**بسکوڕی** / biskuřî/: ناوەڵناو. شەق وتورت و بەکەیف؛ تایبەتمەندی زەرعاتی بە خۆدا هاتوو 🇮🇷 شاداب؛ باطراوت (مزرعە)

**بسکویت** / bisk(i)wît/: ناو. هندۆک؛ گەرگەری 🇮🇷 بیسکویت

**بسکۆ** / bisko/: ناو. بکۆ؛ مافوورە؛ فەرش 🇮🇷 فرش

**بسکۆک** / biskok/: ناو. ئەو بسکەی بەرەو ڕوومەت هەڵدەگەڕێتەوە 🇮🇷 خم گیسو

**بسکۆکە** / biskoke/: ناو. لەرزانە؛ بسکۆلە 🇮🇷 زیور زنانە

**بسکۆڵ** / biskoł/: ناو. پژی گەنمەشامی 🇮🇷 کاکُل کوچک ذرت

**بسکۆلە** / biskole/: ناو. لەرزانە 🇮🇷 زیور زنانە

**بسکۆڵە** / biskołe/: ناو. ۱. گیایەکە لە ئەگریجە ئەکا ۲. بسکی کوڵ و کورت 🇮🇷 ۱. گیاهی است شبیە زلف ۲. زلف کوتاە

**بسکە** / biske/: ناو. بزەی لێو و گەشیی ڕوو لە خۆشیان 🇮🇷 تبسم

◙ **بسکەی سمێڵ**: زەردەخەنەی پەنامەکی 🇮🇷 خندەی زیرلب

◘ **بسکە هاتن**: بە کەیف و بە دەماخ بوون 🇮🇷 شاد و سرحال بودن

**بسکەبسک** / biskebisk/: ناو. ۱. کاری بە خۆشییەوە هاتن و چوونی تازەلاو بە دەور و بەری کیژاندا ۲. کاری مرقاندنی نێری بە دەور و بەری بزن لە کاتی بە تەگە بووندا 🇮🇷 ۱. جولان تازەجوان ۲. عمل گُشن شاک حول بُز مادە

**بسمار** / bismar/: ☜ **بزمار**

**بسمارک** / bismarik/: ☜ **بزمارۆك**

**بسمارە** / bismare/: ناو. ۱. ☜ **بزمارۆك** ۲. موو کە لە دەست دێ و زۆر بەژانە 🇮🇷 ۱. ☜ **بزمارۆك** ۲. کژدُمە

**بسمیل** / bismîl/: ناو. غوسڵ 🇮🇷 غُسل

**بسوڵدان** / bisułdan/: ناو. ۱. موسوڵدان؛ میزەڵدان؛ کیسەی میز لە لەشدا ۲. *[مەجاز]* گون 🇮🇷 ۱. مثانە ۲. خایە

**بسوت** / b(i)sot/: ناو. بزووت؛ بزۆت؛ چلۆسک 🇮🇷 نیمسوز

**بسوخ** / b(i)sox/: ☜ **بزۆق**

**بسەرڤەهاتی** / biservehatî/: ناو. بەسەرهات 🇮🇷 سرگذشت

**بسیرە** / b(i)sîre/: ناو. بەرسیلە؛ قۆرە؛ هاڵە 🇮🇷 غورە

**بسیلاک** / b(i)sîlak/: ☜ **بسێلاک**

**بسێلاک** / b(i)sêlak/: ناو. بسیلاک؛ زیخەڵان؛ زەوینێک کە لم و زیخی زۆر بێت 🇮🇷 شنزار

**بسێن**[1] / bisên/: ناو. کڕیار 🇮🇷 خریدار

**بسێن**[2]: ناوەڵناو. ۱. کڕیار؛ سێنەر ۲. داگیرکەر 🇮🇷 ۱. خریدار ۲. غاصب

**بسێنەوە** / b(i)sênewe/: ناو. ئەوانەی بۆ ستران‌بێژ یان شیوەن‌گێڕ دەگێڕنەوە 🇮🇷 گروە کُر

**بشافتن** / b(i)şaftin/: چاوگ. هەڵپشاوتن؛ گووشین بە دەست لە ناو ئاودا 🇮🇷 افشردن

**بشتاڵ / biştał/**: ئاوەڵناو. لاپرەسەن ☰ فضول

**بشرین / bişrîn/**: ناو. لێوکەن؛ بزە ☰ لبخند

**بشکاف / bişkaf/**: ناو. ئامرازی هەڵوەشاندنەوەی تەقەڵ ☰ بشکاف

**بشکافتن / bişkaftin/**: چاوگ. هەڵپشکووتن؛ هەڵوەشانی جێ تەقەڵ و پەیوەندی ☰ شکافتن

**بشکانن / bişkanin/**: چاوگ. گریان بە دەنگی نزم؛ بە نووزە گریان ☰ مویە کردن

**بشکفتی / bişkiftî/**: ئاوەڵناو. خەنان؛ پشکووتوو ☰ شکفتە؛ بازشدە

**بشکڤاندن/ bişk(i)vandin/**: چاوگ. ١. تترووکاندن ٢. کاردۆژە کردن ☰ ١. تخمە شکستن ٢. درآوردن مغز گردو و مانند آن

**بشکڤین / bişk(i)vîn/**: چاوگ. سەر سووڕمان ☰ شگفت‌زدە شدن

**بشکوژ / bişkuj/**: ناو. ١. ☜ بشکووژ ٢. قوپچە ☰ ١. ☜ بشکووژ ٢. دکمە

**بشکول / bişkul/**: ناو. پشکەڵ؛ کشپەڵ؛ کشپل؛ قشپل ☰ پشکل

**بشکۆژ / bişkoj/**: ناو. ١. ☜ بشکووژ ٢. بشکۆفت؛ دوگمە؛ قۆپچە ☰ ١. ☜ بشکووژ ٢. دکمە

**بشکۆش / bişkoş/**: ☜ بشکووژ

**بشکۆفت / bişkoft/**: ☜ بشکۆژ-٢

**بشکۆک / bişkok/**: ناو. قۆبچە؛ دوگمە ☰ دُکمە

**بشکۆڵ / bişkol/**: ☜ برژانگ

**بشکووڕاندن / bişkûřandin/**: چاوگ. کردنەوە بۆ یەکەمین جار ☰ گشودن

**بشکووڕین / bişkûřîn/**: چاوگ. وەبوون؛ کرانەوە ☰ گشودە شدن

**بشکووژ / bişkûj/**: ناو. بشکوژ؛ بشکۆژ؛ بشکۆش؛ خونچە ☰ غنچە

**بشکوول / bişkûl/**: ☜ بشکووڵ

**بشکووڵ / bişkûł/**: ناو. بشکوول؛ قوڕ؛ هەڕی؛ گڵ ☰ گِل

**بشۆر / b(i)şor/**: ناو. جۆرێ پارچە ☰ نوعی پارچە

**بشۆرە / b(i)şore/**: ناو. خەمی زۆر گران ☰ غم جانگداز

**بشێونە / b(i)şêwne/**: ئاوەڵناو. پشێونە؛ بشێوێن؛ ئاژاوەچی؛ مایەفیتنە؛ کتکەنەفتینە؛ کێشەهەلایسێن؛ سەرەسۆدرە ☰ فتنەگر

**بشێوە / b(i)şêwe/**: ناو. پشێوە؛ ئاژاوە؛ کێشە و هەرا ☰ آشوب

**بشێوی / b(i)şêwî/**: ناو. پشێوی؛ ئاژاوە؛ بشێوە ☰ آشوب

**بشێوێن / b(i)şêwên/**: ☜ بشێونە

**بشێوێنی / b(i)şêwênî/**: ناو. ئاژاوە ☰ آشوب

**بعۆک / b(i)'ok/**: ئاوەڵناو. دەم و چاو ناحەزی پیاوترسێن ☰ بدریخت

**بغورد / b(i) ğurd/**: ☜ بخوور

**بغوور / b(i)ğûr/**: ئاوەڵناو. خۆبایی؛ غللوور ☰ مغرور

**بغوورد / b(i)ğûrd/**: ناو. بخوور؛ سووتەنی بۆنخۆش ☰ بخور

**بغووردان / b(i)ğûrdan/**: ناو. ئەوەی بخووری تێدا دەسووتێ ☰ بخوردان

**بغووز / b(i)ğûz/**: ☜ بخووز

**بفرا / bifra/**: ناو. هەڕشتەی خاوی بۆنەدراو ☰ رشتەی خام

**بفرۆش / bifroş/**: ناو. فرۆشیار ☰ فروشندە

**بفکار / bifkar/**: ئاوەڵناو. دڵخورت؛ نیگەران؛ پەرێشان ☰ نگران

**بڤ[1] / biv/**: ناو. بڤە؛ تاپۆ؛ تابلۆی ئاگاداری لە مەترسی لە سەر شەقام ☰ تابلوی خطر

**بڤ[2]**: ئاوەڵناو. بڤە؛ مەترسیدار؛ قەدەغە ☰ ممنوع

**بڤ[3]**: دەنگەناو. بڤە؛ دەنگی ژەنگەسوورە ☰ صدای زنبور

**بڤ[4]**: دەنگ. بڤە؛ وشەی منال ترساندن ☰ کلمەی

هشدار به بچه

**بڤار** / b(i)var/: ناو. بوار ☰ گدار

**بڤاشتن** / b(i)vaştin/: چاوگ. هەڵوەشاندن ☰ از هم گشودن

**بڤر**[1] / bivir/: ناو. تەور؛ بیور؛ تەوری دار بڕین ☰ تَبَر

**بڤر**[2]: ناوەڵناو. *[کنایه]* خۆپەسەند؛ خۆهەڵکێش ☰ خودپسند

**بڤز** / b(i)viz/: ناو. ١. بووز؛ داری بووز ٢. کرێژە بەرد؛ قەوزەی بەرد ☰ ١. درخت پشه ٢. گل سنگ

**بڤزیی** / bivzeyî/: ناوەڵناو. بە ڕەنگی کرێژە بەرد ☰ به رنگ گل سنگ

**بڤڤە** / bivve/: سارستە. بڤ؛ بقە ☰ کلمەی هشدار به بچه

**بڤکێ** / bivkê/: ناو. سووزانی؛ ژنی حیز؛ خۆفرۆش ☰ فاحشه

**بڤۆک** / b(i)vok/: ناو. جەغزێکی تۆڕداری چووک بۆ ماسی گرتن ☰ انبرک و تور کوچک دستەدار ماهیگیری

**بڤە** / bive/: ☜ بڤ

**بڤەشاندن** / b(i)veşandin/: چاوگ. هەڵوەشاندن ☰ متلاشی کردن

**بڤەشین** / b(i)veşîn/: چاوگ. ١. هەڵوەشان ٢. لێک جوێ بوونەوە ☰ ١. از هم پاشیدن ٢. از هم گشودن

**بڤێنەڤێ** / bivênevê/: ناوەڵکار. خوایی‌نەخوایی؛ بتەوێ‌نەتەوێ ☰ خواه‌ناخواه

**بقلیقۆک** / biqlîqok/: ناو. بکلیقۆک؛ بڵقی ئاو ☰ حُباب

**بقم** / biqim/: ناو. دەرمانەسووری چاو؛ دەنکێکە سوور بۆ دەرمانی چاو ☰ دانەای گیاهی درمان بیماری چشم

**بقوتبازۆ** / b(i)qutbajo/: ناو. گەمەیەکی منداڵانە ☰ نوعی بازی کودکانه

**بقە** / b(i)qe/: ناو. پڵتە؛ فڵتە ☰ یاوەگویی

**بقەبق** / b(i)qebiq/: ناو. *[مەجاز]* فلتەفلت؛ پلتەپلت ☰ یاوەگویی

**بکرد** / bikird/: ☜ بکەر

**بکرێ‌نەکرێ** / bikrênekrê/: سارستە. ئەرێ نەرێ؛ دوودڵی و ڕاڕایی ☰ بشود نشود

**بکڕ** / bikiř/: ناو. کڕیار؛ بسێن ☰ خریدار

**بکلیقۆک** / biklîqok/: ☜ بقلیقۆک

**بکوژ** / bikuj/: ناوەڵناو. کوشندە؛ کوژەر ‹غەڵبەغەڵبی هەی بکوژ هەستا لە دەوری چواربـاغ/ قادری دەڵلاکە هەر شەو تا سەحەرگەهـ پاسەبان! «سالم»› ☰ قاتل

**بکوژ.بکوژ** / bikuj bikuj/: ناو. کوشت و کوشتاری زۆر ☰ بکش ـ بکش

**بکوژ و ببڕ**[1] / bikuj û bibiř/: ناو. بگر و ببڕ؛ قەڵت و بڕ؛ کوشت و بڕ ‹بکوژ و ببڕێ بوو لەو ناوە، مەپرسە!› ☰ کشت و کشتار

**بکوژ و ببڕ**[2]: ناوەڵناو. بگر و ببڕ؛ خاوەن دەسەڵاتی بێ بەرهەڵست ‹سەردەمێک بکوژ و ببڕی ولات بوو› ☰ حاکم مطلق

**بکۆ** / b(i)ko/: ☜ بسکۆ

**بکە** / b(i)ke/: ناو. پکەی جگ؛ پشتە؛ ئیوەی؛ دۆخی بە ڕوودا کەوتنی میچ ☰ حالت دمر افتادن شتالنگ

**بکەر** / biker/: ناوەڵناو. *[ڕێزمان]* بکرد؛ کرۆک؛ کرکار؛ کەس یان شتێ کە کارێک دەکا یا کردارێکی وە پاڵ دەنرێ ☰ فاعل و مسندٌالیه

**بکەرد** / bikerd/: ناو. *[ڕێزمان]* کرۆک؛ کرگار ☰ فاعل

**بکێڵ** / bikêł/: ناو. زەوی‌کێڵ؛ کەسێ کە بە جووت یان بە بێڵ زەوی وەردەگێڕێ ☰ شخم‌زن

**بکێڵگە** / bikêłge/: ☜ بکێڵ

**بکێڵ‌ومەکێڵ / b(i)kêł û mekêł/**: ناو. سـوورنجان؛ گوڵەگەزیزە ☰ سورنجان

**بکێڵە / bikêłe/**: ئاوەڵناو. بکێڵگە؛ شیاوی کێلان ☰ شخم‌زدنی

**بکێڵەی‌پاییز / b(i)kêłey payîz/**: ناو. سووورنجان؛ گوڵەگەزیزە ☰ سورنجان

**بگار / b(i)gar/**: ناو. بوار: ۱. دەراوی پەڕینەوە لـە ئـاو ‹قـول ڕەش و چـەرمگ لـە بگـارا دەرئەکـەفێ «مەسەل»› ۲. ڕێباز؛ ویەر؛ ڕێگەی بگـاردن ‹دنیـا تەنیا بگاریکە «مەسەل»› ☰ ۱. گُدار ۲. مسیر

**بگاردن / b(i)gardin/**: چاوگ. ۱. ڕابواردن؛ تێپـەڕ کـردن ‹خۆشـی بگـاردووە› ۲. هەڵـتاواندن ۳. پێک‌هێنـان؛ جێبـەجێ کـردن ☰ ۱. گذرانـدن ۲. هضم کردن ۳. انجام دادن

**بگارە / b(i)gare/**: نـاو. ۱. کـار و ڕەوتی ڕابـردن؛ بووردن ۲. دەرفەت؛ ماوە ‹چیدی بگارەت نـەماوە، یان پارەکەت بێنـە، یـا ماڵـەکەم چـۆڵ کـە!› ☰ ۱. گُذران ۲. مجال

⊡ **بگارە دان**: ۱. ڕێگە پێدان؛ دەرفـەت پێـدان ۲. بووردن؛ ڕابردن ☰ ۱. مجال دادن ۲. گُذراندن

**بگر / bigir/**: ئاوەڵناو. هۆی گرتن یان بە گرتن دان ☰ بگیر

**بگر، بکوژ / bigirbikuj/**: ئاوەڵناو. ملـهوڕ؛ زۆرداری بێ‌بەزە ‹دە ساڵان بگرـ بکـوژ هـەر خـۆی بـوو› ☰ ستمکار

**بگر ـ بگر / bigir bigir/**: نـاو. هـەرا و هوریـا؛ قاڵمەقاڵ ☰ دادوهَوار

**بگردگ / bigirdig/**: ناو. ڕابـردووی لـە مێژینـە ☰ گذشتەی دور

**بگردن / b(i)girdin/**: چـاوگ. ۱. بەخشـین؛ مـاڵ دان بە کەسێ ۲. بـووردن؛ چاوپۆشـی کـردن ۳. بـووردن؛ ڕابـردن ‹بگـردن لـەم کۆڵانـە باریکـە حەستەمە› ☰ ۱. بخشیدن ۲. گذشت کردن ۳. گـذر کردن

**بگر و ببڕ / bigir û bibiř/**: ☜ **بکوژ و ببڕ**

**بگرەبـەردە / bigreberde/**: نـاو. بگرەوبـەردە؛ ڕەش‌بگـیر؛ کـاری گـرتن و بـەردان ‹دیسـان لـە بگرەبەردەیی گوڵـچین و باغـەبان/ بولبـول کـەناری گرت و دڵی غونچە ڕاچەنی «نالی»› ☰ بگیر و ببند

**بگرەوبەردە / bigre w berde/**: ☜ **بگرەبەردە**

**بگەڕ[1] / bigeř/**: نـاو. گەشـتیار؛ ئـەوەی بـە دنیـادا دەگەڕێ ☰ سیّاح

**بگەڕ[2]**: ئاوەڵناو. ۱. لە حاڵی گەڕاندا ۲. خولخـۆر ☰ ۱و۲. چرخان

**ـ بگیر / -bigîr/**: پاشەوشە. ۱. ـ گـیری؛ گـرتن ‹ڕەش‌بگیر› ۲. وەرگر؛ ئەستێن ‹حقـوق‌بگـیر› ☰ ۱و۲. ـ بگیر

**بگێڕ / bigêř/**: نـاو. ۱. بەڕێوەبـەر؛ هەڵسـووڕێن؛ کارگێڕ ۲. نمـەدماڵ؛ ئـەوی لـوا دەپەسـتێوی و لبادی لێ چێ دەکا ☰ ۱. مُدیر؛ گرداننده ۲. نمدمال

**بل / bil/**: ئامراز. بەجگە؛ بێجگە ‹هاتە دەسـتێ مـە درەقسێ و دگۆ بل ژ مەلێ/ دەسـت ب کـەس دی د سەمایا کو مەلا تێ نادم «مەلای جزیری»› ☰ بجُز

**بلا / b(i)la/**: ئامراز. بێلا؛ با؛ بهێڵە ‹کەرخین ئـەم د قیامـێ مـە ژ دل پـەردە درانـد/ عارفـێ وەقـتم و مەعرووف بلا بێتـە ژ کـەرخ «مـەلای جزیـری»› ☰ بُگذار

**بلاتـە / b(i)late/**: ناو. بالاتـە؛ سـەرەتای هـەڕەتی میوە ☰ آغاز موسم میوه

**بلاتینک / b(i)latînik/**: ناو. پەپوولە ☰ پروانه

**بلاجوهـەور / b(i)lacûhewr/**: نـاو. هەورەتریشـقە ☰ تُندر

**بلاچە / b(i)laçe/**: نـاو. ۱. بلاچـە؛ برووسـکە ۲. بڵێسە؛ گڕ ☰ ۱. درخشش ۲. شُعله

**بلازیز / b(i)lazîz/**: ناو. بەلازیز؛ گەزیزە؛ گوڵـێکی کورتەبالای خـەت ـ خـەتی ئـاوی و سـپییە لـە

سـەرەتای نـەورۆزدا پەیـدا دەبـێ و زۆر تەمـەن کورتە ☰ گلی که در آغاز بهار روید

**بلاڤ / b(i)lav/:** ☜ **بلاو**

**بلاڤۆک / b(i)lavok/:** ناو. بەلاڤـۆک؛ بلاڤـۆک؛ پەخشە؛ نووسراوە بۆ چاپ و بلاوکردنـەوە (وەک: گۆڤار، ڕۆژنامە و...) ☰ نشریّه

**بلاکوتک / b(i)lakutik/:** ناو. بالـدارێکی دەنـگ خۆشە ☰ پرندەایست خوش صدا

**بلالک / b(i)lalik/:** ☜ **بلاڵووک**

**بلامک / b(i)lamik/:** ☜ **بزمۆک**

**بلامکەر / b(i)lamker/:** ئاوەڵناو. زۆرخۆر ☰ پُرخور

**بلاو / b(i)law/:** ناو. ١. شینگێڕ؛ مـردوو لاوێنـەوە ٢. دانەلغاو ☰ ١. نوحەخوان ٢. دهانەی لگام

**بلاوە / b(i)lawe/:** ناو. ئاڵـقەی ژێـر دانـەلغاو ☰ دهنەی لگام

**بلاوێن / b(i)lawên/:** ئاوەڵناو. ١. نـەرم و دڵـنەواز ‹نە سۆزەی بلاوێنـی مـیری خونـاوەی بـەهاری/ نـە تووکی برای ڕێبواری/ لە کاسی خەوا، فێـری ڕاسـانی ناکـەن «سـوارە»› ٢. لاوێنـەر ☰ ١. لطیـف ٢. تسلی‌دهنده

**بلبال / bilbal/:** ناو. سەوزە؛ سـەوزی؛ سـەوزەواتی خواردن ☰ سبزی خوردن

**بلبسین / bilb(i)sîn/:** چاوگ. وڕ بوون؛ واق‌وڕمـان ☰ شگفت‌زده شدن

**بلبسێن / bilb(i)sên/:** ئاوەڵناو. سـەرگەردان ☰ سرگردان

**بلبل / bilbil/:** ☜ **بولبول**

**بلبلە[1] / bilb(i)le/:** ناو. پلپلـە؛ پرپـرە ☰ آویـزەی گوشوارە

**بلبلە[2]:** ئاوەڵناو. زۆربڵێ؛ فرەوێژ ☰ وراج

**بلبلیشک / bilbl(i)şik/:** ناو. ماسـۆلە؛ ماسـوولە؛ ماسوولکە ☰ ماسولەی نساجی

**بلت / bilt/:** ☜ **بلچ**

**بلج / bilc/:** ☜ **بلچ**

**بلچ / bilç/:** ناو. گۆیژ؛ گێوژ؛ گڤویشک؛ بـرچ؛ بلـج؛ بلت؛ بلەت؛ بلچی؛ بەلەچ؛ بلەتی ☰ زالزالک

**بلچی / bilçî/:** ☜ **بلچ**

**بلسک / bilisk/:** ناو. ١. بسـت ئاسـیاو ٢. ☜ **بستـ١** ☰ ١. قطب آسیاب ٢. ☜ **بست ـ١**

**بلفەتە / bilfete/:** ناو. تاعوون؛ لاڕەشە ☰ طاعون

**بللۆر / billor/:** ☜ **بلوورـ١**

**بللوور / billûr/:** ☜ **بلوورـ١**

**بلماندن / bilmandin/:** چاوگ. پلماندن؛ بۆلانـدن ☰ غرولند کردن

**بلمباس / bilimbas/:** ناو. تەگە؛ نێری؛ سـابرێن ☰ تکه، بُز نَر

**بلوار / bilwar/:** ناو. شـەقامی پـان و بـەرین کـە بووبێتە دوو کەرتی یەک‌لایەنە ☰ بلوار

**بلوێر / bilwêr/:** ناو. ١. بلوول؛ بلوور؛ لوولێ؛ نـای؛ ئامێرێکی مووسـیقا، لـە سـاقەتەی قـامیش یـان چێوێکی باریکی هلۆڵ دروسـت دەکـرێ، پێـنج کونی لە سەر و کونێکیشی لە خوارەوە هەیـە بـۆ جێ قامـک و ڕێـک‌کـردنی دەنـگ، درزێـک لـە سەرەوە بۆ ناو دەم و کونێک لە بنەوە ٢. لوولـک؛ جێ میزی منـاڵ لـە بێشـکەدا ☰ ١. سازِ نـی ٢. لولەی ادرار بچه در گهوارە

⊡ **بلوێر ژەنین:** ☜ **بلوێر لێدان**

**بلوێر لێدان:** بلوێر ژەنـین؛ نـەی ژەنـین ☰ نـی نواختن

**بلوێربەزێن / bilwêrbezên/:** ئاوەڵناو. بلەربـەزێن: ١. تایبەتمەندی منداڵێ کە میزی لە بلوێرەوە سەر دەکـا ٢. */کینایە/* دەڵـەمیز؛ دەڵـەمێز؛ میـزن ٣. */مەجاز/* بزۆز و دانەسەکناو ☰ ١. حالت بچـەای کـە در گهوارە شاشش بیرون بزند ٢. شاشو ٣. ناآرام

**بلوێربێژ / bilwêrbêj/:** ☜ **بلوێرژەن**

**بلوێرپێچ / bilwêrpêç/:** ناو. بلوولـک‌پـێچ؛ پارچـە

پەڕۆیەکە دەیپێچنە بلوولەوە ☰ پارچەای کە دور لولەی داخل گهوارە پیچند

**بلوێرژەن / bilwêrjen/**: ناو. بلووربێژ؛ بلوورڤان؛ بلوولبێژ؛ بلوولژەن؛ بلوێژبێژ؛ بلوێرلێدەر؛ بلوورژەن؛ کەسێ کە بە بلوێر ئاهەنگ لێ دەدا ‹نە بلوێرژەن دەتووڕێنێ لە بلوێر/ نە شۆڕەژن ورینگەی دێ لە بەر بێر «هێمن»› ☰ نی‌نواز

**بلوێرلێدەر / bilwêrlêder/**: ☜ **بلوێرژەن**

**بلوێل / bilwêl/**: ☜ **بلوول**

**بلوێن / bilwên/**: ☜ **بلوول**

**بلۆ / b(i)lo/**: ناو. بلق؛ قول؛ کول ☰ قُل

⊡ **بلۆ دان**: قولت دان؛ کولان و بلق هەلدانی تراو لە سەر ئاور ☰ قُل زدن مایع در حال جوش

**بلۆر / bilor/**: ☜ **بلور-١**

**بلۆری / bilorî/**: ☜ **بلوری**

**بلۆسک / b(i)losk/**: ناو. بلۆسک؛ بستەی ئاش؛ بستی ئاساو ☰ آهن قطب آسیاب

**بلۆق[1] / b(i)loq/**: ناو. پۆڕگ؛ تۆقلە؛ گۆزاولە؛ شۆقل؛ تلۆق؛ تاولە؛ بلۆقە؛ پفیلک؛ ئاوەزوولک؛ ئاوەزوولک؛ تووقالە؛ تیقاولە؛ تووقاولە؛ زیپکەی هەلتۆقیوی پڕئاو لە سەر پێست ‹هەموو گیانی بۆتە بلۆق› ☰ تاول

⊡ **بلۆق دەردان**: ☜ **بلۆق کردن**

**بلۆق کردن**: بلۆق دەردان؛ بلۆق لە سەر پێست هەلهاتن ☰ تاول زدن

**بلۆق[2]**: ئاوەلناو. ١. بالغ؛ پێ‌گەیشتوو؛ خۆناسیو؛ شەیتان‌پێ‌کەنیو ‹منالی چی؟ بلۆق بووە› هەروەها: **بلۆقەت** ٢. چاوزەق؛ چاوزاق ‹تووشی کاورایەکی بلۆق هاتم، لێی ترسام› ☰ ١. بالغ ٢. چشم‌برجسته

**بلۆقکردوو / b(i)loqkirdû/**: ئاوەلناو. قوسیای ☰ تاول‌زده

**بلۆقە / b(i)loqe/**: ☜ **بلۆق[1]**

**بلۆگ / bilog/**: ناو. *[سووکەلە]* وێبلۆگ؛ وێبلاگ؛ جۆرێک ماڵپەڕی ئینتەرنێتی کە بەرهەم و بۆچوونەکانی خاوەنەکەی لە خۆ دەگرێ ☰ وبلاگ

**بلور / b(i)lûr/**: ناو. ١. بللوور؛ بللۆر؛ بلۆر؛ تەورک؛ جۆرێک شیشەی ئەستووری بێ گەرد و گرێ ‹دەغیل! نەکەن بەهیچ جوور/ دروست کەن کۆشکی بلوور «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ٢. بلوێر؛ نای؛ پلوور؛ ئامرازی مووزیک ‹بێ دلبەر و مەی، تەمەن بەسەرچوون هیچە/ بێ ڕەنگی مەی و دەنگی بلوور، بوون هیچە «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ٣. لوولەی نێو لانکی منالان ‹بروانە ئاونگ و گیا، تاکوو بزانن/ ئەم هەر وەکوو زمرووتە، ئەویش چەشنی بلوورە «بێخود»› ☰ ١. بلور ٢. نی‌لبک ٣. لولەی ادرار گهوارە

**بلوربێژ / b(i)lûrbêj/**: ☜ **بلوێرژەن**

**بلورژەن / b(i)lûrjen/**: ☜ **بلوێرژەن**

**بلورسازی / b(i)lûrsazî/**: ناو. ١. کارخانەی بلوور چێ‌کردن ٢. کار و پیشەی بلوور دروست کردن ☰ ١و٢. بلورسازی

**بلورڤان / b(i)lûrvan/**: ☜ **بلوێرژەن**

**بلوری[1] / b(i)lûrî/**: ناو. بلۆری؛ مەرمەڕشا؛ خامی سپی ☰ چلوار؛ قماش سفید سادە

**بلوری[2]**: ئاوەلناو. بلوورین؛ بلۆری: ١. دروستکراو لە بلوور ‹جامی بلووری› ٢. وەک بلوور ‹پەنا بە خوا لە بەزمی جادوییدا/ لە ساقی چاوی و ساقی بلووری «بێخود»› ☰ ١و٢. بلوری

**بلورین / b(i)lûrîn/**: ئاوەلناو. بلووری؛ وەک بلوور ‹چ جوان دوو بالی بلوورین، وەکوو لقی مەرمەڕ/ نەرم ـ نەرم ئەلەرێ «گۆران»› ☰ بلورین

**بلوشک / b(i)lûşk/**: ☜ **باوێشک**

**بلوول / b(i)lûl/**: ناو. بلوور؛ بلوێل؛ بلوێن؛ نای؛ نەی ☰ نی

**بلوولبێژ** / b(i)lûlbêj/: ☜ **بلوێرژەن**

**بلوولژەن** / b(i)lûljen/: ☜ **بلوێرژەن**

**بلولکپێچ** / b(i)lêlikpêç/: ☜ **بلوێرپێچ**

**بلەت** / b(i)let/: ☜ **بلچ**

**بلەتی** / b(i)letî/: ☜ **بلچ**

**بلەخش** / b(i)lexiş/: ناو. جەواهیر ☰ جواهر

**بلەر** / b(i)ler/: ئاوەڵناو. چوارشانە؛ خاوەن شانی پان و سنگی ئەستوور و پتەو ☰ چهارشانه

**بلەربەزێن** / b(i)lerbezên/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **بلوێربەزێن** ٢. پیاوبەزێن؛ زۆر بەهێز و گورد ☰ ١. ☜ **بلوێربەزێن** ٢. مردافکن

**بلەرزەک** / b(i)lerzek/: ناو. بوومەلەرزە؛ ئەردهەژ ☰ زلزله

**بلەرمە** / b(i)lerme/: ئاوەڵناو. بەخۆوە؛ کەڵەگەت؛ ئەستوور و تێکسمڕاو ☰ تنومند

**بلەز** / b(i)lez/: ☜ **بەلەز**

**بلەزندەر** / b(i)lezender/: ئاوەڵناو. زلحۆرت؛ زل و زەبەلاح ☰ لندهور

**بلەکناچێ** / b(i)lekinaçê/: ئاوەڵناو. ژنانی؛ ژنانیلە؛ ژنەڕەنگە؛ سەرژنانە؛ سەرژنانیلە؛ پۆپن؛ کناچلەڕەنگ؛ قالەژنە؛ خاوەن ڕواڵەتی ژنانە (بۆ پیاو) ☰ زن‌نما

**بلەگاز** / b(i)legaz/: ☜ **بەلەنگاز**

**بلەماج** / b(i)lemac/: ناو. پرپۆڵە؛ پەڵوولەی شل؛ چێشتی گزموولەئاردی تراو ☰ آش خورده خمیر

**بلەمو** / b(i)lemû/: ☜ **بزمۆك**

**بلەنگاز** / b(i)lengaz/: ئاوەڵناو. بەلەنگاز؛ هەژار و لانەواز ☰ بینوا

**بلەور** / b(i)lewir/: ناو. شیشە چرا ☰ شیشەی چراغ

**بلەوەز** / b(i)lewez/: ئاوەڵناو. گوێنەبیس ☰ حرف‌نشنو

**بلەوەس** / b(i)lewes/: ئاوەڵناو. هەوەسباز ☰ بولهوس

**بلی** / b(i)lî/: ئامراز. جگە؛ بێجگە ☰ غیر از

**بلیارد** / bilyard/: ☜ **بیلیارد**

**بلیاق** / bilyaq/: ناو. گلێنەی چاو ☰ مردمک

**بلیان** / bilyan/: چاوگ. پێگەیین؛ زانین ☰ فهمیدن

**بلیت** / b(i)lît/: ناو. بلیت؛ پسوولە؛ پەتە ☰ بلیت

**بلیز** / b(i)lîz/: ناو. بڵێسە ☰ شعله؛ زبانه‌ی آتش

**بلیشا** / b(i)lîşa/: ☜ **باوێشك**

**بلیکە** / b(i)lîke/: ☜ **بەلۆکە**

**بلیمانە** / b(i)lîmane/: ناو. لیمان؛ تراوێکی خەستی کێشدارە لەگەڵ منال بووندا لە زێی مێوینە دەڕژێتە دەر ☰ مایع غلیظی که همراه بچه از رحم زائو بیرون می‌ریزد

**بلیمەت**[1] / b(i)lîmet/: ناو. بلیمەت؛ هەڵکەوتە ☰ نابغه

**بلیمەت**[2]: ئاوەڵناو. ١. بلیمەت؛ ژیهاتی؛ هەڵکەوتوو؛ هەڵکەوتە؛ کەموێنە ‹ڕۆڵەی کوردی بلیمەت/ پشتی نەکرد لە میللەت «هێمن»› ٢. *[پلار]* ناشیرین؛ ناحەز ☰ ١. نابغه ٢. زشت

**بلین** / b(i)lîn/: ناو. وەرزوو؛ مشتوماڵ؛ ماساژ ☰ ماساژ

**بلێنە** / b(i)lêne/: پێرۆ. ← **خلێنەوبلێنە**

**بڵ** / biɫ/: ئاوەڵناو. بڵە؛ نەرمی زیاد لە پێویست ‹شیلانەکە بڵ بووە› ☰ پلاسیده

**بڵا** / b(i)ɫa/: ئامراز. با؛ بهێڵە؛ دەبا ‹گەهێ ئاهوورەوش شاهی، گەهێ گەوهەرمەنیش ماهی/ بلا با سینە سەحرا بێ! بلا با دیدە دەریا بێ! «نالی»› ☰ بگذار

**بڵاجەو** / b(i)ɫacew/: ئاوەڵناو. بەلاجەوی؛ سەیر ☰ عجیب

**بڵاچنین** / b(i)ɫaçnîn/: چاوگ. برووسکە دان (هەور) ‹ئاسمان بلاچنی› ☰ آذرخش زدن

**بڵاچوهۆڕ** / b(i)ɫaç û hoř/: ناو. هەورەتریشقە و

هەورەگرمە 🇮🇷 رعد و برق

**بلاچه** / b(i)łaçe/: ناو. برووسکە 🇮🇷 آذرخش

**بلاچەئاگر** / b(i)łaçe'agir/: ناو. بلێسە 🇮🇷 شعله

**بلالوێ** / b(i)łalwê/: ☜ **بلالوك**

**بلالک** / b(i)łałik/: ☜ **بلالوك**

**بلالـوک** / b(i)łałûk/: نـاو. برالـووک؛ بەلالـووک؛ بەرالووک؛ برالـوێ؛ برالـوو؛ ئالۆبالـۆ؛ ئالووبالـوو؛ ئالووبەلالووک؛ ئالووبالوو؛ ئاربیـاری؛ ئـەلی‌قـالی؛ بلالوێ؛ وەلالیک؛ هالووبلالووک؛ هالۆبەلالـووک؛ هالەبەلالـــووک؛ هەلمـــەلووک؛ هەلهـــەلووک؛ هالوبەلالووک؛ هالوبلالـووک؛ بـەلالیک؛ بلالـک؛ بلالک: ١. دارچکێکی گەلا هێلکەیی گوڵ سـپی و چەترییـە ٢. میـوەی خڕۆکـەی ئـەو دارە کـە سوورکەڵەیەکی ترشی ئـاودارە و دەخـورێ 🇮🇷 ١. درخت آلبالو ٢. آلبالو

▣ **بلالـوکـە کێویلـە**: گلیـــەر؛ گـــیراز؛ باچـــک؛ هلملووک؛ هەلهـەلاک؛ هـەلالووک؛ هەلوونـە؛ تەڕبی؛ برالـوویی؛ برالـووکە کێـوی؛ بلالـووکە کێفیلە؛ ئالووبالووی کێوی 🇮🇷 آلبالوی کوهی

**بلام** / b(i)łam/: ☜ **بەلام**

**بلان** / b(i)łan/: ئامراز. هەمە؛ بەلام 🇮🇷 اما

**بلاو** / b(i)ław/: ئاوەڵناو. بلاڤ؛ بەلاو؛ بـەلاڤ؛ ولاو؛ وەلاو: ١. پرژ؛ پەرژ؛ پرژ ‹هەر وەسفی رووتـە هـەر قسەیێ وا لە سەر زمان/ هەر سەرفی مووتە هـەرچی خەیالی بلاومە «بێخود»› ٢. گوشاد؛ فرەه ‹بێژنگی کون بلاوم ناوێ› ٣. پەخش ‹خەبەر وا بلاو بووە کە ئازار هاتووە› 🇮🇷 ١. پراکندە ٢. گُشاد ٣. شایع

▣ **بلاو بونەوە**: پەخش بوونەوە 🇮🇷 منتشر شدن

**بلاو کردن**: بەلاڤ کرن 🇮🇷 پخش کردن

**بلاو کردنەوە**: بـەلاو کردنـەوە: ١. پـەرژ کـردن؛ پرژاندن ‹هەوالـیان بـلاو کـردەوە شـت هـەرزان دەبێ!› ٢. ڕاخستن؛ داخستن ‹هـەر سـفرەیان بلاو کردەوە هـەموو چوونـە دەوری› 🇮🇷 ١. منتشر کردن ٢. گسترانیدن

**بلاوە** / b(i)ławe/: ئاوەڵناو. بەلاوە؛ پرژ 🇮🇷 پراکندە

▣ **بلاوە پێ کردن**: بـەلاوە پـێ‌کـردن؛ پەراکەنـدە کردن؛ شێواندنی کۆڕ و دەستەیەک 🇮🇷 متفـرق کردن

**بلاوە کردن**: بەلاوە کـردن: ١. واز کـردن ٢. لـە یەک جیا بوونەوە ‹بلاوەی کرد و ڕۆیی کۆمەڵەی یاران و ئەهلی دڵ/ لە شوومی بەختە مەحوی ماوە بێ یار و ڕەفێق ئەمما «مەحوی»› 🇮🇷 ١. گسـتردن ٢. متفرق شدن

**بلاوە لێکردن**: دوور کەوتنـەوەی ئاپۆرەیـەک لـە شتێ کە بۆی کۆ بوونەتەوە 🇮🇷 متفرق شدن

**بلاوی** / b(i)ławî/: ناو. ولاوی؛ پژیاگی 🇮🇷 پراکندگی

**بلباس** / biłbas/: ناو. ئەڵماس 🇮🇷 الماس

**بلبل** / biłbił/: ناو. بولبول 🇮🇷 بلبل

**بلح** / biłĥ/: ئاوەڵناو. ١. گـەوج؛ هـیچ‌نـەزان ‹دنیا بەهشتی بلحانە› ٢. جلف؛ هەرزە؛ ئاکار ناپەسـند؛ ڕەوشت ناشیرین ‹بە پـیری مەرگـەوە فرسـەخ بـە فرسەخ ڕۆیشتون مەردان/ ئەوی باکی لـە مـردن بـێ دیارە بلح و نامەردە «مەحوی»› 🇮🇷 ١. ابله ٢. هرزه

**بلحەڕۆ** / biłĥeřo/: ئاوەڵـناو. جلـف؛ حیـز و ئاکـار خراپ 🇮🇷 هرزه

**بلحی** / biłĥî/: ناو. ١. گەوجی؛ نـەزانی ٢. جلـفی؛ ئاکـاری بـێ‌شـەرمانە و ناپەسـەند 🇮🇷 ١. ابلهـی ٢. هرزگی

**بلخ** / biłx/: ناو. بلغ: ١. باری سەر زمان و لێـو ٢. تلفی ئاوی کولاو 🇮🇷 ١. بار زبان ٢. جرم آب جوشیده

**بلخەم** / biłxem/: ☜ **بەڵغەم**

**بلسک** / b(i)łisk/: ناو. پلووسک؛ پلوورە 🇮🇷 ناودان

**بلغ** / biłğ/: ☜ **بلخ**

**بلغەتـە** / biłğete/: نـاو. بامرنـــێ؛ تـــاعوون؛ چاوقووڵکە؛ لاڕەشە 🇮🇷 طاعون

**بلفەتە** / biłfete/: ناو. نەخۆشی تاعوون 🇮🇷 طاعون

**بلق**[1] / bilq/: ناو. تۆقلەی ئاو ☰ حُباب آب

☐ **بلقی سەر ئاو**: [کینایە] بێنرخ و زووتێپەڕ ‹کە خاکی، خاکی دامەن بە! وەگەرنە تۆزی بەر بادی/ کە ئاوی، ئاوی گەوهەر بە! وەگەرنە بلقی سەر ئاوی «نالی»› ☰ بی‌ارزش و زودگذر

**بلق**[2]: دەنگەناو. قولت؛ قول؛ دەنگی کولینی ئاو ☰ صدای غلیان آب

**بلقاس** / biłqas/: ئاوەڵناو. خۆبایی؛ خۆبەزل‌زان ☰ متکبر

**بلقاسم** / biłqasim/: ناو. وتاربێژ؛ گوتاردەر ‹لە شاریکا مەلا نەو، کەلەشێر ئەویتە بلقاسم!› ☰ سُخنران

**بلقاو** / biłqaw/: ناو. زەل؛ زەلکاو؛ زۆنگ؛ باتلاخ ☰ باتلاق

**بلقن** / biłqin/: ئاوەڵناو. چلمن ☰ خلمو

**بلقە** / biłqe/: دەنگەناو. دەنگی هاتنە دەرەوەی هەوای ناوەوە ☰ صدای غلیان

**بلقەبلق** / biłqebiłq/: دەنگەناو. بلق؛ بلقە ☰ صدای غلیان مایع

☐ **بلقەبلق کردن**: کوڵیان ☰ غل ـ غل زدن آب

**بلقەتاڤ** / biłqetav/: ناو. تاریکەشەو ☰ شب تاریک

**بلقەدەرە** / biłqedere/: ناو. جانەوەریکی زەردی پانکەلەیە لە پەسپەسەکۆلە دەکا ☰ جانوری زرد شبیه رُطیل

**بلم**[1] / biłm/: ناو. ١. بۆڵە؛ پرتەوبۆڵە ٢. [کینایە، شوورەیی] تر ☰ ١. غرولند ٢. گوز

**بلم**[2]: ئاوەڵناو. بەم؛ گەورە؛ زل ☰ گُنده

**بلماندن** / biłmandin/: ☜ **بۆلاندن**

**بلمن** / biłmin/: ئاوەڵناو. بلمەبلمکەر؛ بۆڵەبۆڵ‌کەر ☰ غُرغُرو

**بلمەبلم** / biłme biłm/: دەنگەناو. بۆڵەبۆڵ ☰ غرولند

☐ **بلمەبلم کردن**: بۆڵەبۆڵ کردن ☰ غرولند کردن

**بلمەبلمکەر** / biłmebiłmker/: ☜ **بلمن**

**بلن** / b(i)łin/: ☜ **بلند**

**بلناهی** / b(i)łinahî/: ☜ **بلندایی**

**بلنایی** / b(i)łinayî/: ☜ **بلندایی**

**بلند** / b(i)łind/: ئاوەڵناو. بلن؛ بلیند؛ بلنگ؛ بەرز ‹ئەو ڕەنگە سوورە بوو کە لە ئاسۆی بلندی کورد/ مزدەی بەیانی بۆ گەلی دوور و نزیک ئەبرد «پیرەمێرد»› ☰ بلند

**بلندایەتی** / b(i)łindayetî/: ناو. بەرزی ☰ بُلندی

**بلندایی** / b(i)łindayî/: ناو. بلناهی؛ بلنایی؛ بلیندایی؛ بەرزایی ‹هەر کەسێ بەرزەفڕە زوو دەمرێ/ بای بلندایی سەرودل دەگرێ «هەژار، بۆ کوردستان»› ☰ بُلندا

**بلندبالا** / b(i)łindbała/: ☜ **بالابەرز**

**بلندپایە** / b(i)łindpaye/: ئاوەڵناو. پایەبەرز؛ خاوەن پلە و پایەی بەرز ☰ بلندپایه

**بلندکراو** / b(i)łindk(i)raw/: ئاوەڵناو. هەڵبڕاو؛ بەرزەوەکرراو ☰ بلند شده

**بلندی** / b(i)łindî/: ناو. بلنی؛ بلیندی؛ بلنگی؛ بەرزی ☰ بلندی

**بلندین** / b(i)łindîn/: ناو. سەردەرانە؛ ئاسانە ☰ آستانه

**بلندێتی** / b(i)łindêtî/: ناو. بەرزی ☰ بلندی

**بلنگ** / b(i)łing/: ☜ **بلند**

**بلنگۆ** / biłingo/: ناو. بلیندگۆ؛ بەرزەواچ ☰ بلندگو

**بلنگی** / b(i)łingî/: ☜ **بلندی**

**بلنی** / biłinî/: ☜ **بلندی**

**بلۆسک** / b(i)łosk/: ☜ **بلۆسك**

**بلۆق** / b(i)łoq/: ئاوەڵناو. زەق؛ بەرچاو ☰ برجسته؛ برآمده

**بلوت** / b(i)łût/: ناو. دیس؛ قاپی درێژۆکە بۆ پلاو ☰ دیس

**بلۆزە** / b(i)łûze/: ☜ بلێسە

**بلۆک** / b(i)łûk/: ☜ بلۆگ

**بلۆکە** / b(i)łûke/: ئاوەڵناو. فش و فۆڵ ‹بۆ کلێلەت قوڕ بپێوم وەک قوڕی سەر شانمە/ بەفر و باران و بلووکەت هەر وەکوو گریانمە «قانع»› ☰ نرم و مُتخلخل

**بلوگ** / biłûg/: ناو. بلووک؛ مێگەل ☰ رمەی گوسفند

**بلوم** / b(i)łûm/: ناو. هان؛ دنە؛ هانە ☰ تحریک

**بلە** / b(i)łe/: ☜ بڵ

**بلەڵ** / b(i)łeł/: ☜ بەڵێ[2]

**بلیت** / b(i)łît/: ☜ بلیت

**بلیمەت** / b(i)łîmet/: ☜ بلیمەت

**بلیند** / b(i)łînd/: ☜ بلند

**بلیندایی** / b(i)łîndayî/: ☜ بلندایی

**بلیندگۆ** / b(i)łîndgo/: ☜ بلنگۆ

**بلیندی** / b(i)łîndî/: ☜ بلندی

**بلینەبێژ** / b(i)łînebêj/: ناو. بلیندگۆ ☰ بلندگو

**بلێزە** / b(i)łêze/: ☜ بلێسە

**بلێسک** / b(i)łêsk/: ناو. چنچک؛ پلە گۆشت ☰ چنجە؛ تکە گوشت

**بلێسکە** / b(i)łêske/: ناو. ١. ☜ بلێسە ٢. فیچقە ☰ ١. ☜ بلێسە ٢. فوران

**بلێسە** / b(i)łêse/: ناو. بلێزە؛ بلووزە؛ بلێسکە؛ گڕی ئاگر ‹بلێسەی دەروون نە سینەم خێزان/ نالەم ئەلفەراق یەعقووبی بێزان «مەولەوی»› ☰ لهیب

**بلێسەدار** / b(i)łêsedar/: ئاوەڵناو. گەش ☰ فروزان

**بلێشە** / b(i)łêşe/: ناو. بەلا؛ چۆرتم ☰ بلا

**بلێک** / b(i)łêk/: ناو. کرێوە ☰ بوران برف

**بم**[1] / bim/: ناو. ١. بێدەنگی؛ قڕ و قپی ٢. شابوو؛ کوندەگا ☰ ١. سکوت ٢. شاەبوف

**بم**[2]: ئاوەڵناو. ١. زلحۆرت؛ تەژەی ناقۆلا ٢. بترسێن ☰ ١. لندهور و بدقیافە ٢. ترسناک

**بمارکی** / bimarkî/: ناو. جۆرێک دمەڵ و کوانی بەژان ☰ نوعی دُمل چرکی دردناک

**بمانێ** / bimanê/: ناو. قڕ و قپی بە کۆمەڵ ☰ سکوت جمعی

**بمبسیک** / bimbisîk/: ناو. گیایەکی کوێستانییە ☰ گیاهی کوهستانی

**بمومو** / bimûmû/: ئاوەڵکار. مووبەموو؛ سەرلەبەر ‹تەفتیشێ بمووموو بکە گەر ئەم ب خەتائین/ هینجا نە کە بێتن تە ولاتێ تە جیهێ من «مەلای جزیری»› ☰ موبەمو

**بمەش** / bimeş/: ناو. پیاسە ☰ پیادەروی

**بن**[1] / bin/: ناو. ١. ڕیشە؛ پنج؛ پنجک؛ بەشی بنەهەردی گیای تۆمدار یان بێخ و ڕیشەی هەر شتێ ‹نرکە و گوڕەی شەماڵە کە هات، چەشنی شێری نەڕ/ چووزەی بنی درەختە لە دوژمن کە کەوتە گەڕ «قانع»› ٢. ژێر ‹بچینە بن ئەو دارە› ٣. یەکەی ژماردنی دار و نەمام ‹سێ بن چنار› ٤. سەلک ‹بنە چەوەندەر› ٥. کچێنی؛ ڕووسووری ‹بووکەکەی بنی نەبووە› ٦. دوایی؛ ئاخر ‹سەر و بنی ئەو کارە کێ ئەیزانێ؟› ٧. بێخ؛ قووڵایی ‹ئەو بە ئاسمانا فڕی، دنیا گەڕا، چووە بن بەحر/ دەک نەمێنم! کاری ئێوەش هەر لە ژوور دانیشتنە «هێمن»› ☰ ١. ریشە؛ بُن؛ بیخ ٢. زیر ٣. اصلە ۴. ریشەی غدەای ۵. بکارت ۶. آخر؛ نهایت ۷. عُمق

▣ **بن پژان** کچێنی لە دەست دان ☰ بکارت از دست دادن

**بن پژاندن/ پژانن** کچێنی بردن ☰ بکارت برداشتن

**بن ڕژان** کچێنی لە دەس دان ☰ از بین رفتن بکارت

**لە بن هاتن** تەواو بوون؛ خەلاس بوون ‹هەمیشە دیدە بەحری گەوهەر و دل پڕ نە نەقدی داغ/ لە بن نایێ بە مەسرەف، چونکە خەزنەی من

خودادادە «مەحوی»› ☰ تە کشیدن

**لە بن هێنان** بنبڕ کردن؛ لە ڕیشە دەرهێنان ‹بە ئیمای دیدەیی مەعشوقە عاشق کێو لە بن دێنێ/ لە لای سالم کەنندەی بێستوون موژگانی شیرین بوو «سالم»› ☰ از ریشە درآوردن

**بن**۲: ئامراز. بێخی؛ بنی ‹بن دیان› ☰ بیخ؛ تەِ

**بن ـ**۳: پێشوشە. پاڵ ـ ؛ پەنا ‹بندەس؛ بنماڵ› ☰ بغل؛ کنار

**بنئامۆزا / bin'amoza/:** ناو. ئامۆزازا ☰ فرزند فرزند عمو

**بناجانگ / b(i)nacang/:** ناو. بناژانگ؛ لاجانگ ☰ عارض

**بناخە / b(i)naxe/:** ☜ بناغە

**بنار / b(i)nar/:** ناو. ۱. بنارام؛ داوێن؛ دامێن؛ بنەتار؛ پاڵدامێن؛ پاڵداوێن؛ پێدەشت؛ خواری یاڵ و چیا ‹تاوانم ئەوەیە کوردم/ خەڵکی بناری هەڵگوردم «هێمن»› ۲. گەورەی ماڵ؛ سەرۆکی خێزان ۳. دەمەقاڵە ‹وردە بنارێک بوو، شوکور کۆتایی هات› ٤. ڕێی هەوراز؛ ڕێگای لێژ ☰ ۱. دامنەی کوە ۲. سرپرست خانوادە ۳. مُشاجرە ۴. راە شیبدار

**بنارام / b(i)naram/:** ناو. ۱. ☜ بنار–۱ ۲. قەراخ ‹ئا بەو بنارادا بچۆ!› ☰ ۱. ☜ بنار–۱ ۲. کنارە

**بناژانگ / b(i)najang/:** ☜ بناجانگ

**بناشت**۱ **/ b(i)naşt/:** ناو. ۱. کاری ئاخاوتن؛ قسە کردن ‹هەر دوو جووت بە جووت گفتوگۆیان بوو/ گلەیی و بناشتی ئەمن و تۆیان بوو «موفتی پێنجوێنی»› ۲. شەڕەقسە؛ دەمەقاڵە ☰ ۱. گفتگو ۲. مُشاجرە

**بناشت**۲: پێرۆ. ← **گلە و بناشت**

**بناغە / b(i)nağe/:** ناو. بناخە؛ بنچینە؛ بنەڕەت؛ شەنگستە ‹بە ئاوێستا، بە زەردەشت یان بە ئاگر چۆن نەنازم من؟/ بناغەی وەحدەت و ئەفکاری ئینسانی کە دامەزران «قانع»› ☰ شالودە؛ اساس

**بناغەدارڕژاو / b(i)nağedař(i)jaw/:** ئاوەڵناو. بنیاتنراو ☰ پی‌ریزی شدە

**بناغەدانەر / b(i)nağdaner/:** ناو. هێمدانەر ☰ بنیانگذار

**بناغەیی / b(i)nağeyî/:** ئاوەڵناو. هیمی ☰ اساسی

**بناڤ / b(i)nav/:** ☜ **بناو**۱

**بناقاقە / b(i)naqaqe/:** ناو. بناقە؛ بنی گەروو لە دەرەوە؛ ڕێگەی هەناسە ☰ بیخ گلو

**بناقە / b(i)naqe/:** ☜ **بناقاقە**

**بناگوێ / b(i)nag(i)wê/:** ناو. بنانگوێ؛ بنانگوێچکە: ۱. پەناگوێ؛ پەنای گوێچکە ‹ڕیشێکی پان و تووکی بناگوێ درێژ و لوول/ سۆفی لە دینی لادە بە دیمەن لە جوو دەکا «مەحوی»› ۲. [کنایە] بنانگوێ؛ بنانگوێچکە؛ پەناگوێ؛ زۆر نزیک ‹مردن لە بناگوێماندایە› ☰ ۱و۲. بناگوش

**بنانگوێ / b(i)nang(i)wê/:** ☜ **بناگوێ**

**بنانگوێچکە / b(i)nang(i)wêçke/:** ☜ **بناگوێ**

**بناو**۱ **/ b(i)naw/:** ناو. بناڤ؛ بەناڤ؛ بەناو؛ وناو؛ وەناو؛ بناوی؛ بناوەچ؛ بناوچ؛ وناوچ؛ زوانەمەلووچکە؛ زوانەمەلیچک؛ دارێکی پتەوی پایا لە تیرەی زەیتوون بە گوڵی بێ‌کاسە و جامە کە بەر لە گەڵا کردن دەپشکوێ، چرۆی ڕەش و کولکن، گەڵای شانەیی، بەری وشک و توێکڵدار و ناوکەی ڕۆندارە و بۆ بۆنخۆش کردنی بڕێ شەربەت و خواردنەوە بە کار دەچێ ☰ درخت زبان گنجشک

**بناو**۲: ئاوەڵناو. ۱. نغرۆ؛ قوم لە ئاودا ‹لوتفی بانگوش بوو کە وا لەم حوجرەدا زاناندمان!/ گەر بەنی ئادەم بخنکێتن سەراوە نەک بناوا! «نالی»› ۲. تایبەتمەندی قورستر بوون لە ئاو کە بچێتە بنی ئاوەوە ☰ ۱. غرق ۲. سنگین‌تر از آب

**بناوان / b(i)nawan/:** ناو. ۱. سەرچاوەی ئاو؛ ئەو

شوێنەی سەرەتای ئاو لەوێوە دێت ‹... هەر لە بناوانی دەجلە و فوراتەوە تا لێکدانەوەی دواوانەکەی هاتم... «هەژار، *شەرەفنامە*»› ٢. کابان؛ کەسێ کە کاری ناو ماڵ بەڕێوە دەبا ‹ئەوسا بووین بە بناوان/ بۆ سەرپەرشتی مێردان «پیرەمێرد»› ▦ ١. سرچشمەی آب ٢. خانەدار؛ کدبانو

⊡ **بناوان هەڵبەستن:** جۆگە ساز کردن لە بناوانی ئاوڕا ▦ ساختن جوی در سرچشمەی آب

**بناوانی** / b(i)nawanî/: ناو. کابانی؛ کابانەتی؛ کەبانیتی ▦ خانەداری

**بناوبوێر** / b(i)nawb(i)wêr/: ناو. دەغەزدار؛ دەغەزار؛ لە دەروونەدا ناساز ‹ماوەیەکی دوور و درێژ بناوبوێر بووم! «هێمن»› ▦ بیمارِ روانی

**بناوچ** / b(i)nawiç/: ☜ **بناو**[1]

**بناورە** / b(i)nawre/: ناو. پووشی وردی ناسک کە بۆ ئاور کردنەوە لە بن دەستەچیلەی دەنێن ▦ افروزه

**بناوکەر** / b(i)nawker/: ناو. مەلەوانی بن ئاو؛ نوقڤان ▦ غواص

**بناوکەوتو** / b(i)nawkewtû/: ئاوەڵناو. مرتک ▦ غوطەور در آب

**بناوەچ** / b(i)naweç/: ☜ **بناو**[1]

**بناوی** / b(i)nawî/: ☜ **بناو**[1]

**بنباخەڵ** / binbaxeł/: ☜ **بن‌هەنگڵ**

**بنبار**[1] / binbar/: ناو. لباد یان هەڵدرواوێکی نەرم دەیخەنە سەر پشتی بارەبەر لە ژێر بارەوە ▦ لباد یا هرچە کە بر روی پشت ستوران اندازند

**بنبار**[2]: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* منەتکێش؛ چاوبەرەژێر؛ بەر باری منەت ▦ منت‌کش

**بنباغەڵ** / binbağeł/: ☜ **بن‌هەنگڵ**

**بنباڵ** / binbał/: ناو. ١. کەلەکە؛ خالیگە؛ لابرک؛ خوار شوێنی پێک گەیشتنی برپڕەی پشت و دواییین پەراسوو ٢. ژێر باڵ؛ بن‌دەست؛ بنکەش؛ بن‌هەنگڵ؛ قووڵایی نێوان سنگ و باسک لە ژێر شاندا ٣. *[کینایە]* پەنا؛ پەسیو ‹تازە تێکولم شکاندبوو/ خۆم بن‌باڵت خزاندبوو «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ▦ ١. تُهیگاه ٢. زیر بغل ٣. پناه

**بنبان** / binban/: ناو. میچ؛ سرمیچ ▦ سقف

**بنبڕ** / binbiř/: ئاوەڵناو. بنەبڕ؛ شوێنەواربڕاو ▦ ریشەکن

⊡ **بنبڕ بون:** لە ناو چوون. هەروەها: **بنبڕ کردن** ▦ ریشەکن شدن

**بنبزو** / binb(i)zû/: ناو. بن کلکی یەکسەم ▦ زیر دُم

**بنبزێو** / binb(i)zêw/: ناو. بن‌بزێوکە؛ بەستە و گۆرانی سووکەڵەی خۆش کە گوێگر دەخاتە جووڵەوە ▦ آهنگ رقص

**بنبزێوکە** / binb(i)zêwke/: ☜ **بنبزێو**

**بنبەردۆک** / binberdok/: ناو. گیایەکی کوێستانی ▦ گیاهی کوهی

**بنبەرەقی** / binbereqî/: ناو. گیایەکە تامی ڕێواس دەدا ▦ گیاهی است با مزەی ریواس

**بنبەس** / binbes/: ☜ **بن‌بەست**

**بنبەست**[1] / binbest/: ناو. بن‌بەس؛ ڕێ و کۆڵانێ کە سەرێکی گیرابێ ‹بن‌بەستی یەکەم› ▦ بُن‌بست

**بنبەست**[2]: ئاوەڵناو. بن‌بەس؛ سەرێکی گیراو (ڕێ و کۆلان) ‹کۆلانی بن‌بەست› ▦ بُن‌بست

**بنبەگ** / binbeg/: ☜ **بن‌بەڵگ**

**بنبەڵگ** / binbełg/: ناو. بن‌پەل؛ بن‌بەگ؛ بن گەڵای تووتن ▦ برگ زیرین بوتەی توتون

**بنبیڤ** / binbîv/: ناو. ١. نەغمە؛ ڕێگەی دەسکرد بە بن عەرزدا ٢. خانووی ژێر عەرز ▦ ١. نقب ٢. خانەی زیر زمینی

**بنبێژنگ** / binbêjing/: ناو. بن‌ژیل؛ بن‌بێژینگ؛ بن‌پاژینە؛ ئەوی لە بێژنگ دەکەوێ ▦ نخالەی غربال

**بن‌بێژینگ** / binbêjîng/: ☜ **بن‌بێژنگ**

**بن‌پاژینە** / binpajîne/: ☜ **بن‌بێژنگ**

**بن‌پاڵ** / binpał/: ناوەڵکار. تەنیشت؛ لا؛ کن ▬ کنار؛ جنب

**بن‌پزو** / binp(i)zû/: ناو. قوشقون؛ پاڵوێنی بن کلکی ولاخی سواری ▬ پاردُم

**بن‌پژاو** / binp(i)jaw/: ناوەڵناو. *[ناشیرین]* تۆڵەشکاو ▬ بکارت ازاله شده

**بن‌پشک** / binpişk/: ناو. ١. کچێ ناودێر کرابێ کە بدرێ بە ژن بۆ برای ‹بێر و هاوێری لەگەڵ کاکی نەکربا بن‌پشک/ چۆن دەمانبوو ئەو هەموو گۆشت و پەنیر و بەرگنە؟ «هێمن»› ٢. تیر و پشک ▬ ١. دختری که در عوض زن برادر نامزد شده باشد ٢. قرعه‌کشی

**بن‌پەرگ** / binperg/: ناو. ژێرچنی پەرگەمای کڵاش ▬ حاشیەی گیوه

**بنپەڕ** / binpeř/: ناو. جۆرێ چەک ‹بیلجوملە ب زەرب و زەند و بنپەڕ/ ئینان ژ مەڕا ب شیر و شەشپەڕ «خانی»› ▬ نوعی اسلحه

**بن‌پەل** / binpel/: ☜ **بنبەڵگ**

**بن‌پەلک** / binpelk/: ناو. پاپەل؛ بن‌گەڵا ▬ برگِ پیر

**بن‌پێست** / binpêst/: ناو. پووک؛ بن‌پێست ▬ زیر پوست

**بن‌پێڵاو** / binpêław/: ☜ **بن‌کەوش ـ٢**

**بنتا** / binta/: ناو. ١. ☜ **نۆنەمام ـ٢** ٢. ☜ **بنەتا**

**بنتاتی** / bintatî/: ناو. جۆرێک ترێ ▬ نوعی انگور

**بن‌تان** / bintan/: ناو. ١. لای ژێرووی پەرژین و تیغە دیوار ٢. ئێڵەگ؛ سوخمە؛ سیخمە ▬ ١. پی پرچین یا تیغه ٢. یلک

**بنتاو** / bintaw/: ☜ **بنەتا**

**بن‌ترنە** / bintiřne/: ناو. ئەو تەختەی کە دەکەوێتە بەین ڕایەڵی گورد و شێرە لە فەرشدا ▬ تختەای که میان تارهای فرش قرار می‌گیرد

**بن‌تل** / bintil/: ناو. ١. سەرە؛ یەکەمین گوێزی گوێزێن ٢. ددانە؛ دیانە؛ بەردێکی چووک کە دەخرێتە بن بەردێکی زلەوە تا نەگلێ ▬ ١. گردوی اصلی گردوبازی ٢. ریزەسنگی که زیر تلەسنگ نهند که نغلتد

**بنتەک** / bintek/: ئامراز. لە تەنیشت ▬ در کنار

**بن‌تەمەڵە** / bintemełe/: ناو. بنەڕەت ▬ شالوده

**بن‌تیان** / bint(i)yan/: ناو. هەڵوای بە بنی مەنجەڵەوە چەسپاو ▬ تەگرفتەی حلوا

**بنتیک** / bintîk/: ناو. پراوە؛ پرۆ؛ دروومانی کاتی کە جلدوور دەیکا ▬ پرو لباس

**بنج** / binc/: ناو. بن؛ ڕیشە ‹لە زاڵم چاکە ناوەشێتەوە/ گیا لە سەر بنجی خۆی ئەڕوێتەوە «پیرەمێرد»› ▬ ریشه

⊡ **بنج داکوتان**: ڕیشە قایم کردن ▬ ریشه دوانیدن

**بنجک** / bincik/: ناو. پنچک؛ دەوەن؛ شخەڵ ▬ بوتەی درختی

**بنج‌وبناوان** / binc û b(i)nawan/: ناو. بنەچەکە و بنەڕەت ‹هەرچی کەوتە بەر چاوانی/ چووە بنج‌وبناوانی! «بێکەس»› ▬ اصل و نصب

**بن‌جۆخین** / bincoxîn/: ناو. بن‌خەرمان؛ بن کۆی خەرمان؛ ئەوەی لە خەرمان دەمێنێتەوە ▬ تە خرمن

**بنجۆر** / bincor/: ناو. پەیدۆز؛ تۆژەر؛ پەیجۆر ▬ جستجوگر

**بنجۆری** / bincorî/: ناو. پەیدۆزی؛ پەیجۆری ▬ جستجو

**بنجۆڕی** / bincořî/: ناو. کاری تۆژینەوە و لێکۆڵینەوە ▬ پژوهش؛ تحقیق

**بن‌جوو** / bincû/: ناو. بنەجوو؛ نۆموسوڵمانی بنەچەک جوو ▬ بچه یهودی نومسلمان

**بن‌جووجکە** / bincûcke/: ناو. کلێجە؛ کلێنچکە؛

ئێسکی قوون 🇮🇷 مهره‌ی انتهایی ستون فقرات

**بنجی / binçî/**: ئاوەڵناو. بنـەڕەتی؛ بنـەمایی (... تێکەڵی لەگەڵ کوردەکانی ئەوێ، فێری یەکێ لە سێ لەهجـە بنجییەکـەی زمـانی کـوردی (لەهجـەی کرمانجی) کردم «زەبیحی») 🇮🇷 اساسی؛ پایه

**بنج / binç/**: ناو. پیـاز؛ پیـواز؛ سـەلک؛ بنۆکـەی هەڵمساوی پیواز کە پێگەیشـتووەکەی بۆیـەکی توندی هەیە و تۆژاڵ ـ تۆژاڵە 🇮🇷 پیاز

**بن‌چاخ / binçax/**: ناو. قەباڵـەی مڵـک 🇮🇷 سـند مالکیت

**بنچغ / binçiğ/**: ناو. تەنشـت؛ لا؛ بنپـاڵ 🇮🇷 پهلـو؛ جنب

**بنچک / binçik/**: ناو. دەوەن؛ پنچـک؛ پنجـک 🇮🇷 بُتّەی درخت جنگلی

**بنچڵ / binçił/**: ناو. بنەتا؛ بنتاو 🇮🇷 جوانه از بن ساقه

**بنچە / binçe/**: ناو. بنچینە؛ زوڤر؛ ڕەگەز 🇮🇷 اصل و نسب

**بن‌چەک / binçek/**: ناو. تاچـەک؛ ئـەو بەشـە لـە دەستەچەک کە دەمێنێتەوە 🇮🇷 تەچک

**بن‌چین / binçîn/**: ناو. ڕەگ و ڕیشە 🇮🇷 رگ و ریشه

**بنچینە / binçîne/**: ناو. بنچێنە؛ بنـەڕەت؛ بناخـە: ۱. بنـەوا؛ بەشـی ژێـرەوەی دیـوار (بنچینـەی مزگەوت نیشتۆتە ناو چەم/ ڕوو بەرەو قیبلە پشت لـە جەهەننەم «گۆران») ۲. هـیم؛ سـەرجەمی کـار و هەموو بـەراوردێک بـۆ دەسـپێکردنی (بنچینـەی شادیت جە بێخ بەرئاوەرد/ جە ڕای مۆڵەت دوور هـەر چێوەت کەرد، کەرد «مەولەوی») 🇮🇷 ۱. پی ساختمان ۲. اساس؛ شالوده

**بنچینەیی / binçîneyî/**: ئاوەڵناو. بەریما 🇮🇷 نژادی

**بنچێنە / binçêne/**: ☜ بنچینە

**بن‌خرمان / binxirman/**: ☜ بن‌خەرمان

**بن‌خـەرمان / binxerman/**: نـاو. بـن‌خرمـان؛ بن‌جۆخین؛ بن کۆی خەرمان؛ ئەوەی لە خەرمان دەمێنێتەوە 🇮🇷 ته خرمن

**بـن‌داڕۆک / bindarok/**: نـاو. ۱. گیایەکـە ۲. سەیران؛ گەشـت و گـوزار 🇮🇷 ۱. گیـاهی اسـت ۲. گردش

**بندرخە / binderxe/**: ناو. شەشەم حەوتەی زستان 🇮🇷 ششمین هفته‌ی زمستان

**بنـدڕس / bindirřis/**: ئاوەڵـناو. ڕەسـەن؛ جسـن؛ ئادەر 🇮🇷 اصیل

**بـن‌درواو / bindirwaw/**: ئاوەڵـناو. شـیرازەبەن؛ شیرازەبەند 🇮🇷 شیرازه‌شده

**بن‌درو / bind(i)rû/**: نـاو. ۱. درووماـنێ کـە لـە دەرەوە دیـار نـەبێ ۲. درویـنـەی لـە ژێـرووی چلدانەوە ۳. کاری دادروونی زارکی تێر و جەواڵ تا ئەو جێی بکرێ و نـەخلێ 🇮🇷 ۱. پُشت‌دوزی ۲. درو غله از بیخ ۳. دوخت جوال طوری کـه غلـه‌ی آن تکان نخورد

**بندڕڕس / bindiřřis/**: ئاوەڵـناو. ڕەسـەن؛ هـیلاو 🇮🇷 اصیل؛ نجیب

**بن‌دڕیـایی / bindiřyayî/**: نـاو. ۱. قـەرزاری ۲. بێ‌بنی 🇮🇷 ۱. بدهکاری ۲. بی‌بکارتی

**بندک / bindik/**: ناو. ئەو شـوێنەی لـە ئـاش کـە تەوەرەی لە سەرە 🇮🇷 جای قطب در آسیاب

**بندنۆ / bindino/**: ناو. پووک 🇮🇷 لثه

**بن‌دۆک / bindok/**: ناو. ۱. دۆک؛ ئـەو سـپیاتییەی لە تاواندنەوەی ڕۆنی کـەرەدا سـەر دەکـەوێ ۲. شۆکە؛ ئەو لیجقە شیرنەی لە پەڵکی زرعات دەدا و ناشیرینی دەکا ۳. ئەو خورییە زبرەی لە شـانە کردندا دەمێنێتەوە و بۆ ڕستن نابێ 🇮🇷 ۱. سپیدک کره ۲. سپیدک نباتات ۳. بُنجُل پشم

**بندوورە / bindûre/**: ناو. مێلاقە؛ گوڵاڵە سـوورە 🇮🇷 شقایق

**بن‌دەس / bindes/**: ☜ بن‌دەست

**بن‌دەست[1] / bindest/**: نـاو. بـن‌دەس؛ بـن‌هـەنگڵ؛

خالیگه ‹بن‌دەستم دیشێ› ☰ زیربغل

**بن‌دەست**[٢]: ئاوەلناو. بن‌دەس؛ ژێردەست؛ ڕاژێر ‹ئەو ئاغا بوو ئێمەش هەموو بن‌دەستی› ☰ زیردست

**بن‌دەست**[٣]: جێناو. بن‌دەس؛ پاڵ‌دەس ‹بن‌دەستەکەت هەر وەنەوزی دەدا› ☰ بغل‌دستی

**بن‌دەست**[٤]: ئامراز. بن‌دەس؛ لە پەنا؛ زۆر نزیک کە دەست بیگاتێ ‹لە بن‌دەستی دانیشتبووم› ☰ بغل‌دستِ

**بن‌دەستی** / blindestî/: ناو. چەپۆکەسەری؛ چۆنیەتی چەوسانەوە ☰ تحت سلطه و ستم

**بن‌دەسی** / bindesî/: جێناو. پاڵ‌دەسی؛ ئەوی لە پەناوە ☰ بغل‌دستی

**بن‌دەق** / bindeq/: ناو. هەڕەت؛ جەنگە ☰ عنفوان

**بن‌دیان** / bind(i)yan/: ناو. ١. ژێر دیان ٢. ☜ بن‌فلە ☰ ١. زیر دندان ٢. ☜ بن‌فلە

**بندین** / bindîn/: ناو. مەرخ؛ تەخت؛ شوێنی پێداچوونی ئاو ☰ بستر رودخانه

**بن‌دیوار** / bindîwar/: ناو. ١. بنەڕەت هیم؛ بناغە ٢. پای دیوار ‹دەستی من داوێنی تۆ، دیوارەکەت باش بۆیە کە!/ با بە شەو سەرمای نەبێ منداڵی بن‌دیواری کورد «قانع»› ٣. مووچەخۆری لاکوت؛ ئەوەی لە شوێنێکدا کار ناکا، بەلام مووچەی لێ وەردەگرێ ‹سیستەمی نوێی دابەشکردنی مووچە، دووموچەیی و بن‌دیوار ناهێڵێت› ☰ ١. پایه ٢. پای دیوار ٣. حقوق‌بگیر رانتی

**بنرچلەک** / binřiçłek/: ناو. ڕەگەز؛ ڕەگەما؛ بنچینە ☰ نژاد

**بن‌ڕدێن** / binř(i)dên/: ناو. بن‌ڕیش؛ مووی بەرچێلەی پیاو ☰ موی زیر چانەی مردان

**بن‌ڕەتەوە** / binřetewe/: ناو. سەرکان؛ دامەزرێنەری بنەماڵەیەک لە پادشایان ☰ سرسلسله

**بن‌ڕەخ** / binřex/: ناو. بنەڕەت؛ بناغە؛ خیم؛ هیم ☰ بُنیان

**بن‌ڕیش** / binřîş/: ☜ بن‌ڕدێن

**بن‌ڕێسمە** / binřêsme/: ناو. پاژنەی دەرگا ‹... ئەگەر ئەم قامووسە لە بن‌ڕێسمەی دەرگای کەوشکەنی پێشخانەی بارەگای زمانی کوردیدا جێگای ببێتەوە، خۆم بە بەختەوەر دەزانم ... «زەبیحی»› ☰ پاشنەی در

**بن‌ژیل** / binjîl/: ☜ بن‌بێژنگ

**بنست** / binist/: ☜ بست ـ١

**بنستر** / binistir/: ناو. پەیژە؛ پەینجە؛ پاپەینجە ☰ نردبام

**بن‌سست** / binsist/: ئاوەلناو. لەق؛ لەق و لەوار ☰ لق

**بن‌شڕ** / binşiř/: ئاوەلناو. [مەجاز] بێ‌مایە؛ هیچ‌وپووچ ‹وەکوو خۆمە لە بەر چاو شەنگ و ڕێکم/ چ زانێ کەس چ گەند و بن‌شڕێکم! «هەژار، بۆ کوردستان»› ☰ تهی‌مایه

**بن‌عانە** / bin'ane/: ناو. جۆرێ پێڵاوی قەدیمی ژنان، پاژنەکەی تەقەی دەهات ☰ نوعی کفش زنانه

**بن‌فلە** / binfiłe/: ناو. بن‌دیان؛ بنفلەهـ؛ بنفەلە؛ خاچ‌پەرستی نۆموسوڵمان ☰ مسیحی تازه مسلمان شده

**بنفلەهـ** / binfiłeh/: ☜ بن‌فلە

**بنفەلە** / binfele/: ☜ بن‌فلە

**بنقرووژنەک** / binq(i)rûjnek/: ناو. ئەوک؛ قورگ؛ قوڕوو ☰ حلق

**بن‌قۆڵ** / binqoł/: ناو. پاژی سێ سووچی کراسی ژنان کە دەکەوێتە ژێر باخەڵ و سەرقۆڵی پێدا ئەدروون ‹بن‌قۆڵەکەی کەتانە، سەرقۆڵەکەی گازرە/ ئەگەر دایکی ڕازی بێ، شیروایییەکەی حازرە «فولکلۆر»›. بەرانبەر: **سەرقۆڵ** ☰ بخشی از آستین پیراهن زنانه

**بنک** / bink/: ناو. ١. ئاغزەجگەرە؛ قونچکەی

سیغار ٢. گەڵای خوارەوەی ساقەتەی تـووتن ٣. بن؛ لای ژێروو ٤. کووتاڵ و ماڵی زۆری بازرگانی 🇮🇷 ١. فیلتر سیگار ٢. برگ‌های زیرین ساقەی توتـون ٣. پایین ۴. انبوه کالا

**بنکدار / binikdar/:** ناو. بازرگـانی کـۆمفـرۆش 🇮🇷 تاجر عمده‌فروش

**بنکڕ / binkiř/:** نـاو. بنکڕکـە؛ بنکڕنـە؛ بنکڕنـەک؛ کڕنە؛ بڕکن؛ کڕکڕە؛ کڕکڕەمزێ؛ توێەک لە بـرنج یا نان یان سێفەزەمینە کە لـە بـنی مەنجەڵـەی پلاوی دەخەن و دەبرژێ 🇮🇷 تەدیگ

**بنکڕکە / binkiřke/:** ☜ بنکڕ

**بنکڕنە / binkiřne/:** ☜ بنکڕ

**بنکڕنەک / binkiřnek/:** ☜ بنکڕ

**بنکلک / binkilk/:** ناو. *[پلار]* شوێنی هەسـتۆک 🇮🇷 نقطەی حسّاس

⊡ **بنکلک خوراندن** *[کنایە، پلار]* فریودان بە قسـەی خۆش 🇮🇷 چرب‌زبانی کردن

**بنکلک ژان کردن/ ئێشان** پێ‌ناخۆش بوونی کاری باشی کەسێکی‌تر 🇮🇷 از خوبی دیگری آزردن

**بنکلێشە / bink(i)łêşe/:** ناو. ١. هندروو؛ دەروون؛ ناولەش ٢. *[کنایە]* فکر و بیر 🇮🇷 ١. اندرون ٢. ذهن

⊡ **بنکلێشە چوون** ☜ **چوونە بنکلێشەوە**

**چوونە بنکلێشەوە** *[مـەجاز]* بـن‌کلێشـە چـوون؛ فریودان؛ هەڵفریواندن 🇮🇷 فریب دادن

**بنکوانیلە / bink(i)wanîle/:** ناو. جۆرێ کولێرە 🇮🇷 نوعی نان گردە

**بنکۆش / binkoş/:** ناو. ژێرداوێن 🇮🇷 زیردامان

**بنکۆشک / binkoşk/:** نـاو. ژێرخـان؛ هـۆدەی ژێرزەمینی 🇮🇷 اتاق زیرزمینی

**بنکۆڵ / binkoł/:** ناو. بنکۆڵی؛ بنکەن؛ بنکەنـد: ١. ڕەوتی لە بنەوە هەڵکەندنی دیوار بۆ ڕووخانـدنی ٢. ڕەوتی دانەوەی بنی ڕەز و تـووتن بـۆ بـەهێز کردنی 🇮🇷 ١. عمل پی کندن دیوار بە قصـد تخریـب ٢. کار کندن پیرامون مَو و توتون برای تقویت آن

⊡ **بنکۆڵ کردن** ١. کەندنی مەزرا ‹شۆڕەژن بنکـۆڵ نەکا بڕکەی بە قرچەی نیوەڕۆ/ چۆن لە کاڵەک تێر دەبێ ئەو زگـزلە بێستانڕنە؟ «هێمن»› ٢. *[کنایە]* کنە کردن و پیلان گێڕان دژی کەس، بەرنامـە یان تـاقمێکی کۆمەڵایـەتی تـا سـەر نەکـەوێ ‹هەر کارێکی باش بکرێ، ڕووس بنکۆڵی دەکا› 🇮🇷 ١. کندن زمین زراعی ٢. توطئە کردن علیە شخص یا گروهی

**بنکۆڵی / binkołî/:** ☜ **بن‌کۆڵ**

**بنکە / binke/:** نـاو. ١. بنە؛ مەکۆ؛ مەکۆگە؛ بینـا و شوێنی مانەوەی ڕێکخراوەیەک ٢. جێگا؛ یاگە 🇮🇷 ١. مقر ٢. جایگاه

**بنکەچرێش / binkeç(i)rêş/:** ☜ **بنەچرێش**

**بن‌کـەش / binkeş/:** نـاو. بنباخـەڵ؛ بنـەنگڵ 🇮🇷 زیربغل

**بن‌کەشی / binkeşî/:** ناو. کاری درز و کەلێن دادان 🇮🇷 درزگیری

**بنکەفشـانێ / binkef(i)şanê/:** نـاو. گولـەش؛ زۆرانی؛ زۆرەبانی 🇮🇷 کُشتی

**بنکەڤیک / binkevîk/:** نـاو. گولـەنەورۆزە 🇮🇷 گـل نوروزی

**بنکەن[1] / binken/:** ☜ **بنکۆڵ**

**بنکەن[2]:** ناوەڵناو. بنەبڕ: ١. لە ڕیشـەوە هەڵکێشـراو ٢. *[کنایە]* لـە شـوێنێک بـار کـردوو، نـەماو ‹بـە خاوخێزانەوە لەو شارە بنکـەن بـوون› ✱ هـەروەها: **بنکەن بوون؛ بنکەن کردن** 🇮🇷 ١و٢. ریشەکن

**بنکەند / binkend/:** ☜ **بنکۆڵ**

**بن‌کەوتـو / binkewtû/:** ناوەڵـناو. نیشـتوو 🇮🇷 رسوب‌کردە

**بن‌کـەوش / binkewş/:** نـاو. ١. بـن‌باخـەڵ؛ ژێـر بەخـەڵ ٢. بـن‌پـێلاو؛ ژێـر کـەوش ٣. مـووررووە قاچاخی؛ جۆرێ مووررووی سێ گۆشە، ملوانکـەی

پێ دەگرنەوە ☰ ١. زیربغل ٢. کفی کفش ٣. نـوعی مُهرەی رنگی سەگوش، گردنبند از آن بافند

**بن‌کێلک** / binkêlk/: ناو. دنه؛ هانه ☰ تحریک

◻ **بن‌کێلک دان**: دنـه دان؛ هانـه دان ☰ تحریـک کردن؛ برانگیختن

**بنگز** / bingiz/: ☜ بست ـ١

**بنگس** / bingis/: ☜ بست ـ١

**بنگست** / bingist/: ☜ بست ـ١

**بن‌گڵته** / bingiłte/: ناوەڵناو. مایەفتنـە؛ ئـاژاوەچی؛ سەرەســـــۆدرە؛ شەڕهەڵـــــخڕێن؛ بشـــــێونە؛ وەرخێزئاشوو ☰ فتنه‌گر

**بن‌گڵخراو** / bingiłx(i)raw/: ناوەڵـــناو. ناشـــــتوو؛ نێژراو ☰ دفن‌شده؛ مدفون

**بنگوس** / bingus/: ☜ بست ـ١

**بنگوست** / bingust/: ☜ بست ـ١

**بنگوفک** / bingufik/: نـاو. بنگـــوف؛ هوڵــــەمەڕ؛ ئاغەڵی ئاژەڵ ☰ آغُل

**بنگوف** / binguv/: ☜ **بنگوفك**

**بنگوڵ** / binguł/: ناو. ١. گیایەکە ٢. دووهەم گوڵ لە گۆڕەوێ‌بازیدا ☰ ١. گیاهی اسـت ٢. اصـطلاحی در بازی جوراب بازی

**بنگۆزەڵه** / bingozełe/: ناو. گیایەکی سـەلکداری کوێسانە ☰ گیاهی کوهی

**بنگووس** / bingûs/: ☜ بست ـ١

**بنگه** / binge/: ناو. ١. بنـەڕەت؛ بناغـه ٢. گـەی قامک ٣. بەند و جومگەی لەش ٤. بنکـه؛ مـەکۆ ☰ ١. پایه و اسـاس ٢. بنـد انگشـت ٣. هـر کـدام از مفاصل بدن ۴. مقر

**بن‌گەڵا** / bingeła/: ناو. پاپـەڵ؛ پەلەسـۆنک ☰ دو برگ انتهایی توتون که می ریزند

**بن‌گیری** / bingîrî/: ناو. کرکاش؛ کاری دوا کـەوتن و لێکۆڵینەوە ☰ تفحص

**بنگێس** / bingês/: ☜ بست ـ١

**بن‌لق** / binliq/: نـاو. تووڵـێ لـە خـوارووی دارەوە هاتبێ ☰ جوانەی پایین تنەی درخت

**بنمیتانـه** / binmîtane/: ناوەڵـــناو. نانــــەجیب؛ ناکەس‌بەچە ☰ بداصل؛ نانجیب

**بن‌میچ** / binmîç/: ناوەڵـناو. سـەرمیچ؛ سقـیـک ☰ سقف

**بن‌نـەگر** / binnegir/: ناوەڵـناو. نەچەسـپ؛ بـێ تایبەتمەندی چەسپین ‹تاوەی بن‌نەگر› ☰ نچسب

**بن‌نیشتو** / binnîştû/: ناوەڵـناو. تانشـین؛ نیشـتوو؛ بێخ‌گرتگ ☰ تەنشین

**بن‌نینۆک** / binnînok/: نـاو. نازەنـاخوون؛ نـازەی ناخوون ☰ بخشی از ناخن که زیر پوست قرار دارد

**بنواشه** / binwaşe/: ناو. بناغه؛ بنەڕەت؛ بناخـه ☰ اساس

**بن‌وشکه** / binwişke/: نـاو. نەخۆشـی بێسـتان ☰ آفت پالیزی

**بنـۆره** / b(i)nore/: نـاو. کونـــدەی چکۆلـــە؛ مەشکۆڵەی چکۆلە بۆ ئاو کێشان ☰ مَشک چرمـی کوچک

**بنۆس** / b(i)nos/: ناو. ١. بنەڕەت ٢. هۆکـار ☰ ١. شالوده ٢. عامل

**بنۆک** / b(i)nok/: نـاو. بنـەرۆک: ١. گیایەکـە بـۆ دەرمانی ئاژەڵ بە کار دێ ٢. قرپۆکی خوری لـە شانە دراو ☰ ١. گیاهی دارویی ٢. بُنجُل پشم

**بنوس** / binûs/: ناو. ١. نووسەر؛ نڤیسەر؛ نڤیسکار؛ نڤیسەڤان؛ نوشتۆخ ٢. ئامرازی نووسین ‹بێ ناوی تۆ نامە هـیچ و پووچـە/ نەتنووسـێ بنـووس، کـەچ و کورووچە «هەژار، *مەم و زین*»› ☰ ١. نویسنده ٢. قلم

**بنه**[1] / b(i)ne/: ناو. ١. گـای بنـە؛ گـای ناوەنـدی گێره ٢. پێداویسـتی سـەفەر ‹شـەنگەبێری یـار و دەسباری کوڕی کۆچـەر نـەبێ/ چـۆن دەگاتـە جـێ هــەوار و هۆبــە ئــەو بارگــە و بنــە؟ «هــێمن»› ٣. حەشارگەی کەوی ڕاو ٤. بنکە؛ مـەکۆ ‹ڕوانگـەی

هەزاران کارەسات/بنە و مەتەریزی خەبات «هێمن»› ٥. بەرگە؛ ڕەبەت؛ سیپەی ڕاوچی ‹من لە بنە دادەنیشم، ئێوە تەقەڕاو بکەن!› ٦. مەنزلگە ‹کەس نایەتەوە بەرەو جیهان لێ پرسم:/ لە کوێیە بنە و باری هەواری یاران؟ «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ٧. ناوەند ‹گا بۆر بکەینە بنە› ٨. قورساییگە؛ گرانیگا؛ خاڵی قورسایی ٩. شوێنی دانیشتن و حەسانەوە لە سەر کار و مەزراوە ☰ ١. گاو وسطی در خرمنکوبی ٢. بار و بُنەی سفر ٣. پناهگاه کبک شکاری ۴. مقر ۵. کمینگاه شکارچی ۶ اقامتگاه ۷. مرکز ۸ گرانیگاه ۹. استراحتگاه

⊡ **بنە کردن**: ١. ماڵ دانە ژێر چاو بۆ دزی ٢. سۆراغ کردنی ماڵی دزراو ☰ ١. خانەای را برای دزدی زیر نظر گرفتن ٢. پی سرنخ دزدی بودن

**بنە گرتن**: نیشتەجێ بوون؛ هێورین ‹... لە ناو چەند بیەکدا بنەمان گرت و کاوڕمان سەربڕی و کەوڵمان کرد و بە زگی زۆر برسییەوە چاوەنۆڕی برژاندنین ... «هەژار، *چێشتی مجێور*»› ☰ منزل کردن

**لە بنە هێنان**: بە تەواوی لە ناو بردن ‹... کاڵ و کوڵیومان دەرفێنن؛ پێشەمان دادەکرمێنن؛ خەریکن لە بنەمان دێنن! ... «هەژار، *چوار ناملکە*»› ☰ نیست و نابود کردن

**بنە ـ**[٢]: پێشوشە. ١. دوا؛ پاش ‹بنەبڕ› ٢. ژێر ‹بنەتان› ٣. سەر ‹بنەجۆ› ٤. ڕیشە ‹بنەچڵ› ٥. دانیشتوو ‹بنەماڵە› ☰ ١. ته ٢. زیر ٣. سر ۴. ریشە؛ اصل ۵. مقیم؛ ساکن

**بنەباب** / b(i)nebab/: ناو. ئاژدا؛ باپیران ☰ نیاکان

**بنەبان** / b(i)neban/: ناو. میچ؛ سرمیچ ☰ سقف

**بنەبڕ** / b(i)nebiř/: ☜ **بن‌بڕ**

⊡ **بنەبڕ بون**: دوا بڕان؛ تەواو بوون. هەروەها: **بنەبڕ کردن** ☰ ریشەکن شدن

**بنەبەنگە** / b(i)nebenge/: ناو. بنەاوان ☰ سرچشمەی آب

**بنەپیت** / b(i)nepît/: ناو. ١. ژێر خەرمان ٢. *[کنایه]* دەسمایە؛ سەرمایە؛ سەرمیان ☰ ١. تە خرمن ٢. سرمایه

**بنەتا** / b(i)neta/: ناو. بنتاو؛ بنتا؛ بنچڵ؛ لق و چرۆی لە بنی دارەوە دەرچوو ☰ جوانه از بن ساقه

**بنەتار** / b(i)netar/: ☜ **بنار ـ١**

**بنەتاڵو** / b(i)netałû/: ناو. کۆڵە؛ کۆڵوو ☰ ریشەی گیاهی کە بە جای هیزم بە کار می‌رود

**بنەتان** / b(i)netan/: ناو. داری ژێرەوەی فەرش کە تەونکەر لە سەری، پەراوێزی هەوەڵ دادەمەرزێنێ ☰ چوب زیرین دستگاه فرش‌بافی

**بنەتۆ** / b(i)neto/: ☜ **بنەتو**

**بنەتۆم** / b(i)netom/: ناو. ١. ☜ **بنەتو** ٢. بنەچە و ڕەچەڵەک ☰ ١. ☜ **بنەتو** ٢. اصل و نژاد

**بنەتۆمە** / b(i)netome/: ☜ **بنەتو**

**بنەتۆو** / b(i)netow/: ☜ **بنەتو**

**بنەتۆوە** / b(i)netowe/: ☜ **بنەتو**

**بنەتو** / b(i)netû/: ناو. بنەتۆ؛ بنەتۆم؛ بنەتۆمە؛ بنەتۆو؛ بنەتۆوە؛ توو؛ تۆم؛ دان ☰ بذر

**بنەتەشی** / b(i)neteşî/: ناو. گوێچەنە؛ چەرمێکی کونە دە کلکەتەشی دەخرێ ☰ حلقەای چرمی در تیردوک

**بنەجۆ** / b(i)neco/: ناو. سەرچاوە: ١. چاوکە ٢. *[مجاز]* ئەسڵ و ڕەچەڵەکی قسە و بابەت ‹بۆ بنەجۆکەی ئەو قسە دەگەڕم› ☰ ١. سرچشمە ٢. اصل و اساس

⊡ **بنەجۆی شتێ دەرهاوردن**: *[کنایه]* ڕاست و ئەسڵی شتێ دەرخستن ☰ حقیقت چیزی را آشکار کردن

**بنەجو** / b(i)necû/: ☜ **بن‌جو**

**بنەجووت** / b(i)necût/: ناو. ١. کەلوپەلی زەویکێلان ٢. داهاتی ساڵانەی زەوی ☰ ١. لوازم

شخم زدن ۲. بهره‌ی سالانه

**بنەجەرگ** / b(i)necerg/: ناو. ۱. ڕەگی نێوان دڵ و جەرگ ۲. بەنـەن جـەرگ؛ بەنـدی جگـەر ☰ ۱. بندی که دل و جگـر را بـه هـم پیونـد زده اسـت ۲. جگرگوشه

**بنەجێ** / b(i)necê/: ئاوەڵناو. پتەو؛ ڕاوەستاو؛ گورخ ☰ استوار

**بنـەچرێش** / b(i)neç(i)rêş/: نـاو. سـترک؛ بنکەچرێش ☰ پیاز گیاه سریش

**بنەچڵ** / b(i)neçił/: ناو. شاڕەگ و ڕیشـەی گیـا و دار ☰ شاهرگ و ریشه‌ی اصلی درخت

**بنەچە** / b(i)neçe/: ناو. بنەچەک؛ بنەچەکە؛ بنە و بنەچەک؛ باب و باپیران ☰ اصل و نسب

**بنەچـەق** / b(i)neçeq/: نـاو. بنەچەکـە؛ ڕەگـەز؛ ڕەگەما؛ بنچینە ☰ نژاد

**بنەچەک** / b(i)neçek/: ☜ بنەچە

**بنەچەکە** / b(i)neçeke/: ☜ بنەچە

**بنەخڵ** / b(i)nexił/: ☜ بنەهەنگڵ

**بنەخوێن** / b(i)nex(i)wên/: ☜ دۆخین

**بنەدڕک** / b(i)nediřk/: ناو. پنجەدڕوو ☰ خاربُن

**بنەرۆک** / b(i)nerok/: ☜ بنۆک

**بنەڕەت** / b(i)neřet/: ناو. ۱. بنیات؛ بنەما؛ بنچینە؛ بنچێنە؛ بنیچە؛ بناخـە؛ بناغـە؛ بنـۆس؛ بنێشـتە؛ شەنگستە؛ خیم؛ هـیم؛ هـێم؛ سـۆکین؛ ڕسـتی؛ پایەی سروشتی یان دەسکرد بۆ لە سـەر دانـانی خانووبەرە ۲. پێز؛ تین؛ شیشـک؛ بنـڕەخ؛ قانگـە؛ سـەرجەمی کـار و هـەموو بـەراوردێک بـۆ دەسپێکردنی کارێک ۳. ڕەگەز؛ بنەچە ٤. بتوون و بنەڕەتی مـاڵ ☰ ۱. شـالودە ۲. پایـه و اسـاس ۳. اصل و نسب ۴. شناژ ساختمان

▣ **بنەڕەت دادان**: ☜ بنەڕەت دانیان

**بنەڕەت دانـەوە**: هەڵـکەندنی زەوی بـۆ دانـانی بناخەی ماڵ ‹بنەڕەتـی بینـای کتێبخانەکـەیان داوە› ☰ پی کندن

**بنـەڕەت دانیـان**: بنـەڕەت دادان: ۱. بناخـە نـان ‹بنـەڕەت مالـەکەیان دانیـا› ۲. *[مەجاز]* ڕچـەی کـارێ شـکاندن؛ دەسـپێکردنی کـارێ ☰ ۱. پی‌ریزی کردن ۲. سنگ بنای کاری را نهادن

**بنەڕەتخواز** / b(i)neřetx(i)waz/: ☜ بنیاتخواز

**بنـەڕەتخوازی** / b(i)neřetx(i)wzî/: ☜ بنیاتخوازی

**بنەڕەتی**[۱] / b(i)neřetî/: ئاوەڵناو. بنیـاتی؛ بنـەمایی ‹کاری بنەڕەتی› ☰ بُنیادی

**بنـەڕەتی**[۲]: ئاوەڵـکار. لـە بنەڕەتـەوە ‹بنـەڕەتی کێشەکان چارەسەر ناکەن› ☰ اساسی

**بنەفش** / b(i)nefiş/: نـاو. ۱. گوڵـی وەنەوشـە ۲. بەنەوش؛ ڕەنگی وەنەوشی ☰ ۱. بنفشه ۲. بنفش

**بنەفشۆک** / b(i)nefişok/: ناو. گوڵێکە بە ڕەنـگ و شێوە لە وەنەوشە دەکا ☰ گلی شبیه بنفشه

**بنەڤان** / b(i)nevan/: ☜ بنەوا-۱

**بنەڤەر** / b(i)never/: ناو. گای بنە ☰ گاو بُنه

**بنەکەنگر** / b(i)nekengir/: ناو. قنگرپاچ؛ قنگـرواچ ☰ بوته‌ی کنگر

**بنەگا** / b(i)nega/: نـاو. جێ هەوار لـە زۆزانـان ☰ منزلگاه ییلاقی

**بنەگر** / b(i)negir/: ئاوەڵناو. جێگیر ☰ ساکن

**بنەگۆگەم** / b(i)negogem/: نـاو. ۱. ڕەگـی گیـای گۆگەم ۲. *[مەجاز]* مرۆی قوڵـە و نالـەبار ‹دەڵـێی بنەگۆگەمـە، پـۆز و هەواشـی هەیـە› ☰ ۱. ریشـه‌ی جوجم ۲. کوتوله‌ی بدترکیب

**بنەما** / b(i)nema/: ناو. ۱. مـاک؛ ماکـە؛ هێـسن؛ تـەنی سـەرچاوە بـۆ تەنـەکانیتـر ۲. بنـەڕەت؛ بنچینە؛ بناغه ۳. مـاکی سـەرەکی ☰ ۱. مـاده ۲. اساس؛ شالوده ۳. بُن‌مایه

**بنەماخواز** / b(i)nemax(i)waz/: ☜ بنیاتخواز

**بنەماخوازی** / b(i)nemaxwazî/: ☜ بنیاتخوازی

**بنەماڵ / b(i)nemał/:** ☜ **بنەماڵە**

**بنەماڵە / b(i)nemałe/:** ناو. بنەماڵ: ١. خێزان؛ خاوخێزان ٢. خانەدان؛ گەورەماڵ؛ جاماڵ؛ ماڵەگەورە؛ بەرەماڵ؛ ئێل و ئووبا؛ سەرجەمی خزمان ■ ١. خانواده ٢. خاندان

**بنەمایی / b(i)nemayî/:** ئاوەڵناو. بنەڕەتی ■ اساسی؛ بنیادی

**بنەنگڵ / b(i)nengił/:** ☜ **بنھەنگڵ**

**بنەنیش / b(i)nenîş/:** ناو. گیرهە؛ ملت؛ ڕەوتی بن نانەوە ■ رسوب

**بنەوا / b(i)newa/:** ناو. ١. بناوان؛ بنەوان؛ بنەوانە؛ بنەڤان؛ کابان؛ ئاگاداری ناو ماڵ ٢. بنەڕەت ■ ١. خانەدار ٢. اساس

⊡ **بنەوا دەرهاوردن:** بنەڕەت دانەوە ■ پی‌کندن

**بنەوان / b(i)newan/:** ☜ **بنەوا-١**

**بنەوانە / b(i)newane/:** ☜ **بنەوا-١**

**بنە و بنەچەک / b(i)ne w b(i)neçek/:** ☜ بنەچە

**بنەوپاڵ / b(i)newpał/:** ناو. پەنا؛ لا؛ تەنیشت ‹هەر لە بنەوپاڵی خۆتدا داینە!› ■ پهلو؛ بغل

**بنەوش[1] / b(i)newş/:** ناو. بەنەوش؛ ڕەنگی بنەوشە ■ بنفش

**بنەوش[2]:** ئاوەڵناو. بەنەوش؛ بە ڕەنگی بەنەوش ■ به رنگ بنفش

**بنەوشان / b(i)newşan/:** ناو. قەزوانی نە فەریک و نە ڕەق کە تێکولی شینی ئامال سوورە؛ وەنەتەقی تەواو نەگەیشتوو ■ بُنەی تمام نرسیده

**بنەوشە / b(i)newşe/:** ناو. ١. گولی وەنەوشە ٢. قوماشێکە ڕەنگ وەنەوش ■ ١. گل بنفشه ٢. پارچەای به رنگ بنفشه

**بنەوشیلە / b(i)newşîle/:** ناو. جۆرە قەزوانێکی ورد ■ نوعی بُنەی ریز

**بنەوە / b(i)newe/:** ئاوەڵکار. ژێر ‹خستیەوە بنەوە› ■ زیر

**بنەوەر / b(i)newer/:** ناو. گای بنە ■ گاو بُنه در خرمن‌کوبی

**بنەوەشی / b(i)neweşî/:** ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. بەڕاستی؛ بێ‌شۆخی ■ جدّی

**بنەیاسەمەن / b(i)neyasemen/:** ناو. مەران ■ درختچەی یاسمن

**بنھەنگڵ / binhengił/:** ناو. بن‌باخەڵ؛ بن‌باغەڵ؛ بنەخڵ؛ بنەنگڵ؛ ژێر باڵ ‹... نە دڵی پێی دڕ ـــ دڕ بووە/ نە بنھەنگڵی خڕ بووە ... «هێمن»› ■ زیربغل

**بنیات / binyat/:** ناو. ١. بنەڕەت؛ هیم؛ بناخە ٢. ئیجاد؛ کار و ڕەوتی سازدان ■ ١. شالوده ٢. ایجاد

⊡ **بنیات کردن:** دامەزراندن؛ دامەرزاندن ■ راه انداختن

**بنیات نان:** بنەڕەت دادان ■ بنیاد نهادن

**بنیاتخواز / binyatx(i)waz/:** ئاوەڵناو. ڕادیکاڵ؛ بنەڕەتخواز؛ بنەماخواز ■ رادیکال

**بنیاتخوازی / binyatx(i)wazî/:** ناو. *[رامیاری]* ڕادیکالیسم؛ بنەماخوازی؛ بنەڕەتخوازی ■ رادیکالیسم

**بنیادەم / binyadem/:** ناو. مرۆڤ؛ بەشەر ■ بنی‌آدم

**بنیچە / b(i)nîçe/:** ناو. ڕەگەز؛ بنەچەکە؛ ڕەچەڵاک ■ اصل؛ نژاد

**بنیچەئەسڵ / b(i)nîçe'esł/:** ئاوەڵناو. نەجیبزادە؛ خانەدان؛ جێ‌گەورە ■ نجیب‌زاده

**بنیسک / b(i)nîsk/:** ناو. بنیسکە؛ سوونکە سابوون؛ سوێنکە سابوون ■ ماندەی صابون

**بنیسکە / b(i)nîske/:** ☜ **بنیسك**

**بنیش / binîş/:** ناو. کۆڕ؛ کاری دانیشتن پێکەوە ‹من دەبێ بڕۆم، بنیشتان خۆش!› ■ نشست

**بنیشت / b(i)nîşt/:** ☜ **بنێشت**

**بنیشتەتاڵ / b(i)nîştetał/:** ☜ **بنێشتەتاڵە**

**بنیشتەتاڵە** / b(i)nîştetałe/: ☜ **بنێشتەتاڵە**

**بنیلە** / b(i)nîle/: ناو. دەغڵی بەر گێرە ☰ خرمن درحال کوفتن

**بنێس** / b(i)nês/: ئاوەڵناو. لەڕ و لاواز ☰ لاغر

**بنێسی** / b(i)nêsî/: ناو. نەخۆشی لەڕ بوون ☰ بیماری لاغری

**بنێسین** / b(i)nêsîn/: چاوگ. ژاکان؛ وشک بوون؛ سیس بوون ☰ پژمرده شدن

**بنێشت** / b(i)nêşt/: ناو. بنیشت؛ بەنووشت؛ بەنیشت: ١. شیرەی دار قەزوان کە وەک هەنگوین دەچێ و ماکێکی زۆر ناسراوە ٢. بنێشتەخۆشکە؛ جاچکە؛ داچکە؛ بنێشتی کولاوی خۆش‌کراو ‹چش کە شک نابەم لە ماڵێ تامە چێشت/ داخەکەم نیمانە زارجوویەک بنێشت «هێمن»› ☰ ١. سقز خام ٢. سقز

**بنێشتۆک** / b(i)nîştok/: ☜ **بەنشتۆك**

**بنێشتە** / b(i)nêşte/: ناو. بنەڕەت؛ بنەما ☰ شالوده

**بنێشتەتاڵ** / b(i)nêştetał/: ☜ **بنێشتەتاڵە**

**بنێشتەتاڵە** / b(i)nêştetałe/: ناو. بنێشتەتاڵ؛ بنیشتەتاڵە؛ بنێشتەتاڵ؛ جاچکەتاڵە؛ بنێشتی نەکولاوی خۆش‌نەکراو ☰ سقز خام

**بنێشتەخۆشکە** / b(i)nêştexoşke/: ☜ **بنێشتەخۆشە**

**بنێشتەخۆشە** / binêştexoşe/: ناو. بنێشتەخۆشکە: ١. جاچکە؛ داچکە؛ بنێشتی کولاوی خۆش‌کراو ٢. *[مەجاز]* قسەی سەر زاری خەڵک کە نابڕێتەوە ‹باسی ئەم ڕووداوە بۆتە بنێشتەخۆشەی زاری خەڵک› ☰ ١. سقز ٢. نقل مجالس

**بنێشە** / b(i)nêşe/: ناو. بنەڕەت ☰ اساس؛ بنیاد

**بو** / bu/: ناو. کوند؛ بایەقوش؛ بوو ☰ جُغد

**بوار** / b(i)war/: ناو. ١. بەهار ٢. دەراوی پەڕینەوە ‹عەشرەت هاوارە! عەشرەت هاوارە!/ کەوتوومە ئاراس، ئاو بێ بوارە «پیرەمێرد»› ٣. دەرەتانی دەرچوون و تێپەڕین ٤. *[مەجاز]* بەش؛ لقەکانی کار و زانیاری ‹لە بواری ژیناسیدا پسپۆڕە› ٥. بوارگە؛ ڕێوشوێنی ئاسایی بۆ جێبەجێ بوونی کارێک ‹داخوازەکانی کرێکاران، دەچێتە بواری جێبەجێ کردن› ٦. بارودۆخی گونجاو بۆ ڕوودانی ڕووداوێک یان جێبەجێ بوونی کارێک ‹بیانییەکان، بواری کار کردنیان بۆ ڕەخسا› ٧. بوارە؛ دەرفەت ‹بواری وەم نادەن لە نێو مێرگە «چەکۆ» هەڵتووتەکێم/ چونکە پرسەی دایکی مل‌بەکوێن و سەرشینم دەوێ «هێمن»› ٨. بابەت؛ بارە؛ وارە؛ چەمک ‹لەم بوارەوە زۆریان قسە کردووە و هیچی لێ شین نەبووە!› ☰ ١. بهار ٢. گُدار ٣. مَفرّ ۴. رشته ۵. فضا؛ شرایط ۶. زمینه ۷. فرصت؛ امکان ۸. باره

**بواردن** / b(i)wardin/: چاوگ. تێنەپەڕ. //بواردت؛ دەبوێری؛ ببوێرە// ١. بگاردن ٢. دەلاندن ٣. لێ‌هەڵبواردن ☰ ١. گذشتن ٢. عبور دادن؛ پس دادن ٣. اهمال کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: بواردوو/ چاوگی نەرێنی: نەبواردن

**بواردوو**[1] / b(i)wardû/: ناو. قاوت؛ قاویت؛ ئاردی دەغڵی برژاو بە شەکر و بەهاراتەوە ☰ قاووت

**بواردوو**[2]: ئاوەڵناو. تێپەڕیو؛ ڕەت بوو ☰ گُذر کرده

**بوارگە** / b(i)warge/: ☜ **بوار-١**

**بوارنامە** / b(i)warname/: ناو. پاسپۆرت؛ پەساپۆرت ☰ گذرنامه

**بوارە** / b(i)ware/: ناو. ١. دەرفەت؛ ماوە ٢. *[مەجاز]* ڕۆژ یان ساڵی بە سەر چوونی مۆڵەت یان مەودایەک ‹ئەم کالایە بوارەی نەماوە› ☰ ١. فُرصت؛ مجال ٢. تاریخ مصرف

⊡ **بوارە دان**: دەرفەت دان ☰ مجال دادن

**بواژۆ** / b(i)wajû/: ☜ **بۆژۆ**[1]**-١**

**بوان** / b(i)wan/: ناو. ئەستوندەکی چادر ☰ ستون خیمه

**بوبل** / bubil/: ☜ **بولبول**

**بوبوکەرە** / bubukere/: ناو. کوند؛ بایەقوش؛ بوو ▤ جُغد

**بوت** / but/: ناو. بت؛ پت؛ خوای دەسکرد ▤ بُت

**بوتری** / butrî/: ☜ بوتڵ

**بوتڵ** / but(i)ł/: ناو. بوتری؛ بتری؛ شووشەی دەمتەنگ بۆ تراو ▤ بطری

**بوجەر** / bucer/: ناو. لەج؛ لەنج؛ ڕق ▤ لج

**بوچکەلە** / buçkele/: ناوەڵناو. قچک؛ بچووک ▤ کوچولو

**بوخ** / bux/: ناو. بۆق: ۱. هەڵم ۲. تەم لە گەرمادا ▤ ۱. بخار ۲. دمەی ناشی از گرما

**بوخار** / buxar/: ناو. هەڵم؛ بۆق ▤ بخار

**بوخاری** / buxarî/: ناو. بخێری؛ بوغاری؛ سۆپا؛ سۆبە؛ سۆمپا ▤ بخاری

**بوخت** / buxt/: ☜ بوختیان

**بوختان** / buxtan/: ☜ بوختیان

**بوختانکەر** / buxtanker/: ناوەڵناو. قسەهەڵبەست ▤ بُهتان زن

**بوختیان** / buxt(i)yan/: ناو. بختیان؛ بوخت؛ بوختان؛ بخت؛ تۆمەت؛ قڕ؛ بافرۆ؛ هەڵبەست؛ هەڵبەستە؛ ڕەوتی لکاندنی کارێکی ناڕەوا بە کەسێکەوە، تا کاتێ کە نەسەلماوە ▤ بُهتان

**بوخچک** / buxçik/: ناو. بوخچەی بچووک؛ پرێسکەی گەورە ▤ بقچەی کوچک

**بوخچە** / buxçe/: ناو. ۱. پریسکە؛ پریاسکە؛ پارچەیەکی چوارگۆشە بۆ کەلوپەل تێ نان ۲. باخچە؛ تلانە؛ جان؛ جێ گوڵ و سەوزی چاندن لە حەوشەدا ۳. گردەڵە؛ خوز؛ نێفەکی دەرپێی ژنان ‹بوخچەی دەرپێکەم تەنگە› ▤ ۱. بُقچە ۲. باغچە ۳. خشتک شلوار زنانە

⊡ **بوخچەی نەکراوە**: *[کنایە]* کیژی ڕەبەن ▤ دختر باکرە

⊡ **بوخچەی دڵ لە لای کەسێ کردنەوە**: *[کنایە]* هەموو قسەیەک بە لای کەسێکەوە گوتن ▤ سفرەی دل را پیش کسی گشودن

**بوخورد** / buxurd/: ☜ بخور

**بوخورد** / buxûrd/: ناو. بخوور ▤ بخور

⊡ **بوخورد دان**: بخوور دان ▤ بخور دادن

**بوداردن** / budardin/: چاوگ. هەڵبگێڕاندن؛ هەڵبگاردن؛ خۆ لێ لادان ▤ اعتنا نکردن

**بودینە** / budîne/: ناو. پوونە؛ پونگە ▤ پونە

**بورج** / burc/: ☜ برج

**بورجقین** / burc(i)qîn/: ناوەڵناو. قاوەیی؛ کەمکۆڵی؛ بە ڕەنگی قاوە ▤ قهوەای

**بوردومان** / burdûman/: ☜ بۆمباران

**بورغو** / burğû/: ☜ برغو

**بورغی** / burğî/: ☜ برغو

**بورغیکەرەوە** / burğîkerewe/: ناو. جەڕبادەر؛ پێچکوشتی؛ پێچبادەر ▤ پیچ‌گوشتی

**بورقی** / burqî/: ناو. برووسکە؛ تێلگراف ▤ تلگراف

**بورکان** / burkan/: ناو. ئاگرپژێن؛ گڕکان؛ ئاگرپژێن ▤ آتشفشان

**بورگ** / burg/: ☜ برۆ

**بوریژ** / burîj/: ناو. پیازداغ؛ پیازداخ ▤ پیازداغ

**بوڕ** / buř/: ناو. ۱. بوار؛ بگار ۲. بڕ؛ کاری تێکەڵ کردن ▤ ۱. گدار ۲. بُر

⊡ **بوڕ خواردن**: تێکەڵ بوون؛ ئاوێتە بوون. هەروەها: **بوڕ دان؛ بوڕ لێدان** ▤ قاطی شدن

**بوڕ** / biwiř/: ناوەڵناو. ببڕ؛ تیژ ‹چەند سالان لەم ناوەدا بکوژ و بوڕ هەر بۆخۆی بوو› ▤ بُرَندە

**بوڕگە** / buřge/: ناو. بان؛ بانە؛ بانوو ▤ فلات

**بوڕمان** / buřman/: ناو. دەنکە هەناری وشک ▤ دانەی انار خشک

**بوڕەبۆسقە** / buřebosqe/: ناو. وڕەبۆسکە؛ گیایەکە ▤ گیاهی است

**بوز** / buz/: ☜ بزن

**بوزه / buze/:** ☜ **بزن**

**بوست / bust/:** ☜ **بست**

**بوشکه / buşke/:** ☜ **بەرمیل**

**بوغاری / buğarî/:** ☜ **بوخاری**

**بوغاڤ / buğav/:** ناو. گیایەکە بە شاخانەوە دەڕوێ ⧖ گیاهی است که بر صخرەها می‌روید

**بوغز / buğz/:** ناو. بوغڵ؛ قین؛ ڕک ⧖ خشم و کین

**بوغزاوی / buğzawî/:** ئاوەڵناو. ڕکلەزگ؛ ڕقاوی ⧖ کینه‌توز

**بوغزلەزگ / buğzlezig/:** ئاوەڵناو. وشترقین؛ نەهێنبڕ ⧖ مُغرض؛ کینه‌ای

**بوغڵ / buğł/:** ☜ **بوغز**

**بوغمه / buğme/:** ناو. گرێ؛ ئۆناق ⧖ عُقده

**بوغور[1] / buğur/:** ناو. لۆک؛ وشتری نێر ⧖ شتر نر

**بوغور[2]:** ئاوەڵناو. یاغی؛ گوێنەدەر ⧖ یاغی

**بوغه[1] / buğe/:** ناو. جوانەگای مل‌ئەستووری نەخەساو ⧖ گاو فربه اختەنشده

**بوغه[2]:** ئاوەڵناو. قەڵەوی خۆبایی (گا) ‹هێندە زل بووە دەڵێی گای بوغەیە› ⧖ فربه مغرور (گاو)

**بوکس / buks/:** ناو. مستانی؛ مستەکۆڵان؛ مشتەکۆڵانی ⧖ بوکس

**بوکڵه / bukłe/:** ☜ **بوکەڵه**

**بوکنی / buknî/:** ناو. پێخەسوو؛ پاخەسوو ⧖ ینگه

**بولبول / bulbul/:** ناو. بلبل؛ بوڵبوڵ؛ بیلبیل؛ بوبل: ۱. واف؛ مەلێکی دەنگ‌خۆشی ئاماڵ‌قاوەییە، بەر زک و ملی سپییە، لە دارستان، مێشەی شێدار و نێو پەرژینان دەژی ‹ڕۆح بۆ نەکا فیدایی سەبا، بولبولی فگار؟/ هەر تاقەسرووەیێکی دەوای سەد برین ئەکا «بێخود»› ۲. *[مەجاز]* زمان‌پاراو؛ زمان‌تەڕ؛ قسەزان ‹بولبول گوڵزار عشقم، باڵ پەروازم نییە/ تا وە سووز دڵ بناڵم، کەس هەماوازم نییە «تەمکین»› ⧖ ۱. بُلبُل ۲. زبان‌آور

**بولبوله / bulbule/:** ناو. لوولەی تەنگی تۆنگ ⧖ لوله‌ی تنگ پارچ

**بوڵبوڵ / bułbuł/:** ☜ **بولبول**

**بوم / bum/:** ناو. کوند؛ بایەقوش؛ بوو ⧖ جُغد

**بومباردمان / bumbard(i)man/:** ☜ **بۆردومان**

**بونیا / bunya/:** ئاوەڵناو. بەردەوام؛ پایەدار ‹حافز مەنویسوود ڕەفیق کیمیاس/ نەمەیوود وە دەست تا دونیا بونیاس «شامی»› ⧖ برقرار

**بوها[1] / buha/:** ناو. بایی؛ نرخ؛ بهێ ⧖ نرخ

**بوها[2]:** ئاوەڵناو. بایەخدار؛ گران‌قیمەت ⧖ قیمتی

**بوهار / buhar/:** ☜ **بەهار**

**بوهارتن / buhartin/:** چاوگ. تێپەڕین؛ بواردن؛ ڕابردن ⧖ گذشتن؛ عبور کردن

**بوهاری / buharî/:** ☜ **بەهاری**

**بوهرین / buhrîn/:** چاوگ. ۱. بزڕکانی تەوشی وەک شیر ۲. پیر بوون؛ بە سەر چوون (گیا و ...) ⧖ ۱. فاسد شدن شیر و مانند آن ۲. پیر شدن گیاه

**بوهل / buh(i)l/:** ناو. گەلی؛ دەرە؛ دۆڵی تەنگ و قووڵ ⧖ درّه

**بوهوست / buhust/:** ☜ **بست ـ۱**

**بوهیشت / buhîşt/:** ☜ **بەهەشت**

**بویتان / buwîtan/:** ناو. باپشکێو ⧖ گُل‌مُژه

**بویسان / biwîsan/:** ☜ **بێستان**

**بویکابچویک / b(i)wîkabiçwîk/:** ☜ **بوکەڵه**

**بویەر / buyer/:** ناو. ڕووداو؛ دەگمە؛ پێشهات ⧖ رُخداد

**بوێر[1] / b(i)wêr/:** ئاوەڵناو. ئازا؛ نەترس؛ ورەدار ‹فیدای کۆڕی خەباتت بم کچی کورد!/ کە گیانباز و فیداکار و بوێری «هێمن»› ⧖ شجاع

**• بوێر[2]:** پاشەوشە. ـ بۆری؛ تێپەڕ ‹بابوێر؛ سال‌بوێر› ⧖ ـگذر؛ ـ سپار

**بوێرانه[1] / b(i)wêrane/:** ئاوەڵناو. ئازایانە ‹کارێکی بوێرانەی کرد› ⧖ شجاعانه

**بوێرانه[2]:** ئاوەڵکار. ئازایانە ‹خۆ کاکیشم لەو

لێرەوارەدا کەوتە داوەوە بەلام بوێرانە خۆی دەرباز کرد› ≡ شجاعانه

**بوێری / b(i)wêrî/**: ناو. ئازایەتی؛ نەترسی؛ وردداری ‹لاوێکە بە ناوی ئاژدین ... لە بوێریدا ... یەکەم پیاوی خاوەن ناوە. «هەژار، *مەم و زین*»› ≡ شجاعت

**بوێژ / b(i)wêj/**: ناو. ١. گوتەبێژ؛ قسەکەر ٢. شاعیر؛ شایەر ٣. گۆرانیبێژ ٤. شاعیری دەسبەجێ ≡ ١. گوینده ٢. شاعر ٣. ترانەخوان ۴. شاعر ارتجالی

**بوێژی / b(i)wêjî/**: ناو. خۆوێژی ≡ بدیهه‌گویی

**بۆ[1] / bo/**: ناو. ١. بۆن؛ بێن؛ بێهن ‹بۆی وەهار مەیۆ، بۆی وەهار مەیۆ/ بۆی هەناسەی گول لە گولزار مەیۆ «فولکلۆر»› ٢. بوو؛ کوند؛ بایەقوش ٣. ولات؛ سەرزەمین ‹هەر تۆم خۆش دەوێ لەم هەرد و بۆیە› ٤. شاگردی مەیخانە ٥. دێراو؛ خەتی قوولّ بۆ ئاوداشتن ≡ ١. بو؛ رایحه ٢. بوم ٣. سرزمین ۴. شاگرد میخانه ۵. جوب آبیاری

⊡ **بۆ پێوە کردن**: بۆ کردن ≡ بو کردن

**بۆ پێوە نەکردن**: *[کنایە]* تام نەکردن؛ هیچ لە شتێ نەخواردن ‹چێشتم بۆ داکرد، بۆی پێوە نەکرد› ≡ دست نزدن؛ نخوردن

**بۆ دان**: دانەوێلە لە سەر ساج برژاندن ≡ بو دادن حبوبات

**بۆ کردن**: ١. بۆن هەلمژین؛ بۆن کردن ٢. گنخان؛ بۆسار بوون ٣. گەنین؛ خراو بوون ≡ ١. بو کردن ٢. بو گرفتن ٣. گندیدن

**بۆ[2]**: ئاوەلکار. *[سووکەلە]* بۆچی؛ بۆچ؛ بوو ‹بۆ نەبمە خێوی نانی خۆم؟/ بۆ نەخوێنم بە زمانی خۆم؟ «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ≡ چرا

**بۆ[3]**: ئامراز. ١. لە بەر؛ بە خاتر ‹بۆ کوردستان› ٢. بەرەو ‹هیچ کەسی وەک من لە حەپسی شەشدەری یەئسا نەهێشت/ ئاسمان وەختێ فرێی دا بۆ زەمین نەردی گوناح «بێخود»› ٣. ژبۆ؛ پەی؛ ئەڕای ‹بۆ ئێمە کار نییە› ٤. شیاوی؛ هێژای ‹قسەی وا، بۆ کردن نابێ› ٥. لە بواری ‹شیعری خەلکی کەی دەگاتە شیعری من، بۆ نازکی؟/ کەی لە دیققەتدا پەتک دەعوا لەگەل هەودا دەکا؟ «نالی»› ≡ ١. به خاطرِ ٢. به سوی ٣. برای ۴. شایستەی؛ قابلِ ۵. از نظرِ

**تێبینی**: «بۆ»ی پیت لەگەل چاوگدا، سارِستەی فیعلی پێک دێنێ، وەک: بۆ بوون (بە چەند مانا)؛ بۆ بردن؛ بۆ چوون (بە چەند مانا)؛ بۆ دانان؛ بۆ دانەوە؛ بۆ ڕەخسان؛ بۆ کران؛ بۆ کردن (کە لەگەل «بۆن کردن»دا جیاوازە)؛ بۆ لوان؛ بۆ (کەسێ/ شتێ) مردن؛ بۆ هاتن (بە چەند مانا) و ...

**بۆ[4]**: پێزو. ← **بەروبۆ**

**بۆبا / boba/**: ئاوەلناو. بۆن گرتوو (ڕۆن و کەرە) ≡ بوگرفته (روغن یا کره)

⊡ **بۆبا بوون**: بۆن گرتن ≡ بو گرفتن

**بۆبڕە / bobiře/**: ناو. بۆچنە؛ ئەو شتەی بۆنی ناخۆش ناهێلێ ≡ بوگیر

**بۆبلات / bobilat/**: ناو. بۆبەلات؛ کارەسات؛ بەلا و چۆرتم ≡ بلا و مصیبت

**بۆبەلات / bobelat/**: ☜ **بۆبلات**

**بۆپرووز / bop(i)řûz/**: ناو. بۆکرووز؛ بۆنی سووتاوی ئێسک و موو ≡ بوی مو و استخوان سوخته

**بۆت / bot/**: ناو. ١. بانیژەی ئاش؛ بانجیلەی ئاسیاو ٢. ئاوبارە؛ قەمتەرە؛ داری درێژ و ئەستوور کە بۆ پەڕاندنەوەی ئاو بە سەر کەندالیدا دەکێشن ≡ ١. بامک آسیاب ٢. قنطره

**بۆتاڤ / botav/**: ناو. بۆتاڤەک؛ گولێکی خۆرسکی مەزرایە بۆ دەرمان ئەشێ ≡ هوفاریقون؛ گُل راعی

**بۆتاڤەک / botavek/**: ☜ **بۆتاڤ**

**بۆترەکێنە / bot(i)rekêne/**: ناو. کارگی بالابەرزی سەرخڕ ≡ نوعی قارچ

**بۆتک / botik/**: ناو. ۱. ئاوبارە؛ بۆت ۲. ئاخوڕ؛ ئالفدان ☗ ۱. قنطره ۲. آخور

**بۆتکە / botke/**: ناو. خانووی لە دار و تەنەکە ☗ زاغه؛ کلبه‌ی از چوب و حلب

**بۆتە / bote/**: ناو. ۱. تەپۆلکە؛ زەقایی زەوی؛ بلندایی کەم لە زەمیندا ۲. دەفرێ کە کانزای تێدا دەتاوێننەوە ‹ڕەنگی ژەنگێکی، کە بۆتەی سروشت/ قالبی منی کوردی پێ دارشت «پیرەمێرد»› ☗ ۱. تپه‌ی کوچک ۲. بوته‌ی ریخته‌گری

**بۆتەگە / botege/**: ناو. بۆدڕن؛ ئەو بۆیەی وەختی تێبەردان لە سابرێن دێ ☗ بوی بز نر هنگام جفتگیری

**بۆتیمار / botîmar/**: ناو. شاهۆ؛ شینەشاهۆ؛ شاوەشینکە؛ باڵدارێکی مل و قاچ درێژە هەر لە دەم ئاوان دەبێ ☗ بوتیمار

**بۆج / boc/**: ناو. فیز؛ دەعیە؛ ئیفادە ☗ فیس؛ افاده

**بۆچ[1] / boç/**: ناو. قوز؛ زێی مێوینە ☗ کُس

**بۆچ[2]**: ☜ بۆچی

**بۆچاڵ / boçał/**: ناو. هەفار؛ نمەبۆ؛ بۆنی دەغڵی نمگرتوو لە چاڵدا ☗ بوی نای غلّه‌ی در چاله مانده

**بۆچرووک / boç(i)rûk/**: ناو. بۆنی سووتاوی چەوری ‹دەیانبەست بۆ کوتانی، مەرج و پەیمان/ هەناوی لێ دەهات بۆچرووک و بۆسۆ «هێمن»› ☗ بوی چربی سوخته

**بۆچڕ / boçiř/**: ناو. بۆنەدووکەڵ؛ بێهنا کادوو ☗ بوی کاه سوخته

**بۆچلێسک / boç(i)łîsk/**: ☜ بۆچەك

**بۆچنە / boç(i)ne/**: ☜ بۆبرە

**بۆچوون[1] / boçûn/**: چاوگ. ۱. بیر بردن ‹چاکی بۆچووی، ڕاست وایە› ۲. بەرەو کەسێ یان شتێ پەلامار دان ‹هەر کە بۆیچووم هەڵات!› ☗ ۱. گمان بُردن ۲. به طرف کسی یا چیزی خیز برداشتن

**بۆچوون[2]**: ناو. بیروڕا؛ ڕوانگە ‹بە بۆچوونی من تا گەندەڵی هەبێ، قەیرانی ئابووری چاری ناکرێ› ☗ دیدگاه

**بۆچە / boçe/**: ☜ بۆچی

**بۆچەک / boçek/**: ناو. بۆچلێسک؛ بۆنی گۆشت و چەوری لە سووتان ‹بۆنی کەبابە، بۆچەکی چزڵێکە دێ لە دوور/ یا بۆچرووکی جەرگ و دڵی هەڵکزاوە «بێخود»› ☗ بوی گوشت و چربی نزدیک به سوختن

**بۆچەکەوڕ / boçekewiř/**: ☜ بۆچەکەهوڕ

**بۆچەکەهوڕ / boçekehuř/**: ناو. بۆچەکەوڕ؛ بۆ چرووکی تون ☗ بوی شدید چربی سوخته

**بۆچی / boçî/**: ئاوەڵکار. بۆچ؛ بۆچە؛ بۆ؛ بوو؛ بووچە؛ ئەڕا؛ لەبەر چی ‹بۆچی نەگریم سەد کەڕەتم دڵ دەشکێنی؟/ بۆ مەی نەڕژێ شووشە لە سەد لاوە شکاوە! «نالی»› ☗ چرا

**بۆخ / box/**: ناو. بۆق؛ هەڵم ☗ بخار

**بۆخاو / boxaw/**: ناو. بۆنی ناخۆشی وەک بۆنی ماسی یا گۆشتی کاڵ ☗ بوی بد

**بۆخشک / boxişk/**: ناو. پلووسک؛ پلوور ☗ ناودان

**بۆخنک / boxink/**: ناو. بۆدڕ ☗ بوی تند عرق بدن

**بۆخۆشکە / boxoşke/**: ناو. ۱. دارێکی لێڕەوارە ۲. گوڵی کەنێرە ۳. هەزبۆ؛ هەزبە ☗ ۱. درختی جنگلی ۲. گلی وحشی ۳. از ادویه‌جات

**بۆخۆیی / boxoyî/**: ناو. بێخەویی؛ دەردێکە لە بێخەوییەوە تووشی چاو دێت ☗ بیماری چشم بر اثر بی‌خوابی

**بۆدار / bodar/**: ☜ بۆندار

**بۆدراو[1] / bod(i)raw/**: ناو. بۆڕاو؛ چێشتی قاوتی گەنمی برژاو ☗ آش گندم بوداده

**بۆدراو[2]**: ئاوەڵناو. برژاو؛ بۆڕاو ‹ژنێ چەند ماشەری پێیە، دەیانهێنێتە بەر تاوێ/ ژنێکی تر بە دەستاڕی دەهاڕێ گەنمی بۆدراوێ «هێمن»› ☗ بوداده

**بۆدرە / bod(i)re/**: ناو. پۆتر؛ کرێمی چەور کردنی

دەست و دەم و چاو ≡ کرم دست و صورت

**بۆدڕ**[1] / bodiř/: ناو. بۆدڕن: ۱. بۆنی توندی ماسی و تەگە ۲. بۆنی ئارەقەی بنەنگڵ و قاچ ۳. هەر جۆرە بۆنی توند و ناخۆش ≡ ۱. بوی تند ماهی و بُز نَر ۲. بوی عرق بدن ۳. بوی تند

**بۆدڕ**[2]: ئاوەڵناو. بۆدڕن؛ ئالوودە بە بۆنی ناخۆش و تن ‹کابرایەکی بۆدڕن هاتە لام› ≡ مُتعفن

**بۆدڕن** / bodiř(i)n/: ☜ بۆدڕ

**بۆدووکەڵ** / bodûkeł/: ئاوەڵناو. بۆن کادوو؛ دووکەلاژۆ؛ بۆنی دووکەڵ لێ نیشتوو ‹ماستی بۆدووکەڵ› ≡ دودی

**بۆدەلە** / bodele/: ئاوەڵناو. گەوج؛ حۆل ≡ گیج؛ نفهم

**بۆدی** / bodî/: ناو. فێڵ و گەڕ ≡ تقلب و مکر

**بۆدیپۆش** / bodîpoş/: ئاوەڵناو. زرێپۆش

**بۆر**[1] / bor/: ناو. ۱. *[ڕێنووس]* بەر؛ بۆرە؛ زەممە؛ ئەو بزوێنە کە وەکوو واوێکی چکۆلەیە (ـُ) و دەچێتە سەر پیتەوە (لە ڕێنووسی کوردیدا، بە واوێکی تەواو دەنووسرێ و دەنگیلەی سادەی ناوە) ۲. ڕەنگی خۆڵەمێشی ۳. بوار؛ ڕێگەی پەڕینەوە ‹بەحسێ زولفا یار پێکرا/ بۆرێ عیشقێ پور فرایە «مەلای جزیری»› ≡ ۱. ضمّه ۲. رنگ خاکستری ۳. گُدار

**بۆر**[2]: ئاوەڵناو. ۱. خۆڵەمێشی؛ بوولین؛ بە ڕەنگی خۆڵەمێش ۲. پنۆک - پنۆکی ڕەش و سپی (یەکسم) ۳. کۆن؛ کۆنە؛ کەڤن ‹مەلای گوندە چیا، نەک شێخی ورگن/ هەیەتی مێزەرێکی بۆر و چلکن «هێمن»› ≡ ۱. خاکستری رنگ ۲. خاکستری با لکەهای سفید (مَرکب) ۳. کُهنه

⊡ **بۆر بوون**/*[مەجاز]* شەرمەزار بوون ‹بەوهەموو دەعیەوە دوێنێ باش بۆر بوو› ≡ شرمنده شدن

- **بۆر**[3]: پاشەوشە./*[پلار]* بۆرە -؛ ناسراوی ناماقووڵ (**تێبینی**: بۆ ئاماژە بە کەس یان شتێ کە بیسەر دەیناسێ و بایەخێکی وای نییە) ‹سەرەنجام جیرانەبۆرم ڕۆیشت و لە کۆڵمان بۆوە؛ ماشینەبۆرت چ لێ کرد؟› ≡ نشانەی معرفەی تحقیرآمیز

**بۆراق** / boraq/: ئاوەڵناو. چاوزەق؛ چاوزاق ≡ چشم‌برجسته

**بۆران** / boran/: ناو. ۱. شلێوە؛ شلۆڤە؛ بەفر و باران پێکەوە ۲. باسریشک؛ باروشک؛ بەفر و باران و با پێکەوە ≡ ۱و۲. بوران

**بۆرانپێچ** / boranpêç/: ناو. کرێوە؛ کرێڤە؛ گەردەلوول وێڕای بەفر ≡ کولاک

⊡ **بۆرانپێچ کردن**:*[کینایە]* ڕاپێچەک دان؛ ڕامالین بە زۆر ≡ غارت و چپاول کردن

**بۆرانخانە** / boranxane/: ناو. کۆترخان ≡ کبوترخان

**بۆرانی** / boranî/: ناو. ۱. چێشتی کوولەکە و ماست ۲. چێشتی باینجان و کووولەکە و تەماتە و قیمە ≡ ۱. آش ماست و کدو ۲. بورانی

**بۆراو** / boraw/: ☜ بۆدراو

**بۆرایی** / borayî/: ☜ بوراهی

**بۆرباو** / borbaw/: ئاوەڵناو. بۆرەکی؛ بۆرەڵۆک؛ ئامالبۆر ≡ مایل به خاکستری

**بۆرچیل** / borçîl/: ناو. ڕەشی ئامالبۆر ≡ سیاه مایل به خاکستری

**بۆرچین** / borçîn/: ناو. سۆنە؛ سەسەوز؛ مێچکە مراوی ماڵی ‹بۆرچین سەرسەوز، بۆرچین سەرسەوز/ فەڕ سواران بۆرچین سەرسەوز «هێسارانی»› ≡ مُرغابی مادە؛ کلەسبز

**بۆردۆر** / bordor/: ناو. دۆرانەدۆر؛ دۆرمادۆر ≡ پیرامون

**بۆردومان** / bordûman/: ناو. بۆمباباران؛ بومباران؛ بومباردمان ≡ بمباران

**بۆرژان**[1] / borjan/: چاوگ. وەنەوزدان؛ دە بیرەخەو چوون ≡ چُرت زدن

**بۆرژان**[2]: ناو. وەنەوز؛ بیرەخەو؛ سووکەلەخەو؛ نێوان

بێداری و خەو ≅ پینکی

**بۆرکار / borkar/**: ئاوەڵناو. بۆرکەلە؛ بۆرکەڵە؛ بە ڕەنگی بۆر ≅ خاکستری رنگ

**بۆرکەلە / borkele/**: ☜ بۆرکار

**بۆرکەڵە / borkełe/**: ☜ بۆرکار

**بۆرمس / bormis/**: ئاوەڵناو. ڕەشی بە ڕاڕای سپییەوە ≅ ابلق

**بۆروبناشت / bor û b(i)naşt/**: ناو. گلە و بنداشت؛ قسە و گلەیی ≅ سخنِ گلایە آمیز

**بۆرە¹ / bore/**: ناو. ١. ☜ بۆر¹ــ ١ ٢. ناوی سەگانە ‹بۆرە و بازە› ≅ ١. ☜ بۆر¹ــ ١ ٢. نامی برای سگ

**بۆرە²**: ئاوەڵناو. ١. بۆر؛ بۆری پنۆک سپی (ئەسپ) ٢. نیمچە؛ نیمە؛ ناتەواو ‹بۆرە خزمایەتییەکمان هەیە؛ بۆرە سەوادێکی هەبوو وای دەزانی تەواوی کردووە!› ٣. بایەر؛ بوور؛ بوورە؛ بەیار ≅ ١. خاکستری با خال‌های سفید (اسب) ٢. نصف و نیمە؛ ناتمام ٣. بایر

**بۆرە ــ³**: پێشوشە. ١. ـ بۆر؛ ناجسن؛ ڕەمەکی و سەرنەناس ‹بۆرەپیاو؛ بۆرەزەلام› ٢. نیمچە؛ ناتەواو ‹بۆرەژان؛ بۆرەخزم› ≅ ١. بداصل و نانجیب ٢. نصفه‌ـ

**بۆرەبنار / boreb(i)nar/**: ناو. *[مەجاز]* دەمەقاڵە؛ نیوەشەڕ؛ کێشەی هەر بە دەم ≅ جدال لفظی

**بۆرەپنە / borepine/**: ناو. قەلەبەلەکە ≅ کلاغ ابلق

**بۆرەپیاگ / borepiyag/**: ☜ بۆرەپیاو

**بۆرەپیاو / borepiyaw/**: ناو. بۆرەپیاگ: ١. پیاگی ڕەمەکی و سەرنەناس ‹کچی مـن بێ بە جووتی بۆرەپیاوێ؟!/ دەکوژرێ، خۆی لە مالی کابە باوێ «هـێمن»› ٢. *[کینایە]* مرۆی سپلە و پێنەزان ‹چاکە لەگەڵ بۆرەپیاو؟!› ≅ ١. مرد عامی و گمنام ٢. آدم ناسپاس

**بۆرەجووڕە / borecuře/**: ناو. بێکاکۆڵ؛ جۆرێ جوڕیە ≅ پرنده‌ایست

**بۆرەخزم / borexizm/**: ناو. خزمی دوور ≅ خویشاوند دور

**بۆرەزەلام / borezelam/**: ناو. تەژەی ناقۆلا ≅ تنومندِ بدترکیب

**بۆرەژان / borejan/**: ناو. بەرەژان؛ ژانە درۆزنە؛ دەسپێکی ژانی منال بوون ≅ درد کاذب قبل از زایمان

**بۆرەسوار / bores(i)war/**: ناو. سواری بێ‌ئەزموون ≅ سوار ناوارد

**بۆرەقانی / boreqanî/**: ناو. گیایەکە سوور ئەکرێتەوە بۆ خواردن ≅ گیاهی خوراکی

**بۆرەقنە / boreqine/**: ئاوەڵناو. ئامال‌بۆر ≅ مایل به خاکستری

**بۆرەک / borek/**: ناو. ١. قژاوکە؛ مەلێکی ڕەنگ بۆرە ٢. خواردنێکە لە هێلکە و ئارد و قیمە ساز دەکرێ ٣. جۆرێک گەچ ≅ ١. زاغ جی‌جاق ٢. خوراکی از آرد و تخم مرغ و گوشت ٣. نوعی گچ

**بۆرەکار / borekar/**: ناو. کاری سووک و کەم‌بایەخ ≅ کار اندک و کم‌ارزش

**بۆرەکە / boreke/**: ناو. گوێلپار؛ گوێرەکەی دوو ساڵان ≅ گوسالەی دوساله

**بۆرەکی / borekî/**: ☜ بۆرباو

**بۆرەکێڵ / borekêł/**: ناو. بەیاربڕ؛ بۆرە؛ کەسێ کە بۆرەی دەرهێناوە ≅ کسی که زمین بایر را شخم می‌زند

**بۆرەڵۆک / borełok/**: ☜ بۆرباو

**بۆرەڵووکە / borełûke/**: ئاوەڵناو. خاکی؛ بە ڕەنگی خۆڵ ≅ خاکی؛ به رنگ خاک

**بۆری¹ / borî/**: ناو. ١. ڕەنگی بۆر ٢. لوولە و شێری ئاو ٣. هەر شتێکی لوولەیی ‹بۆرییەکانی هەناسەدان› ٤. *[مەجاز]* بۆق؛ شیشەی لامپا ≅ ١. رنگ طوسی ٢. لوله و شیر آب ٣. جسمِ لوله‌یی شکل ۴. شیشه‌ی چراغ روشنایی

**بۆری[2]**: ئاوەڵناو. ڕابردوو؛ کۆن ☰ قدیم

**- بۆری[3]**: ☜ **- بویر[2]**

**بۆریا** / borya/: ناو. بووریا؛ حەسیر ☰ بوریا

**بۆریزان** / borîzan/: ناو. کەڕەناچی؛ شەیپوورژەن ☰ شیپورچی

**بۆریژانگ** / borîjang/: ☜ **بۆژانە**

**- بۆرینە** / -borîne/: پاشەوشە. کۆنە و ساڵ بە سەردا هاتوو ‹هەنبانەبۆرینە؛ کلاوەبۆرینە› ☰ -کُهنه

**بۆریە** / bor(i)ye/: ناو. لوولە ☰ لوله

**بۆڕ[1]** / boř/: ناو. ١. تەرە؛ قووڵکەی میوە کە گەڵای تێدا ڕادەخەن و بە گەڵا دایدەپۆشن ٢. گیایەکی باڵا بڵندی گەڵا دەرزی لە بەرەی هەڵز و کەما ٣. شەپۆل ٤. شکست؛ کار و ڕەوتی دۆڕان ٥. بۆڕبۆڕێن؛ ململانێ ☰ ١. چالەای که میوه را در آن ریزند تا برسد ٢. گیاهی برگ‌سوزنی ٣. موج آب ٤. شکست ٥. مسابقه

⊡ **بۆڕ خواردن**: بەزین؛ بۆڕدران ☰ شکست خوردن

**بۆڕ دان**: بەزاندن (بەتایبەت لە شیعرێندا) ‹هەموو فەقێکانی خانەقا دەکەوتنە لایەک و من و هەژاریش لە لایەک، شیعرێنمان دەکرد. بڕوا بکەن بۆڕمان دەدان «هێمن، تاریک و ڕوون»› ☰ شکست دادن (بویژه در مُشاعره)

**بۆڕ دران**: ☜ **بۆڕ خواردن**

**بۆڕ[2]**: ئاوەڵناو. پیر؛ دۆخی لە شلکی و جوانی تێپەڕین ☰ پیر

⊡ **بۆڕ بون**: /کنایه/ پیر بوون؛ بە سەر چوون ‹کەنگر بۆڕ بووە، بۆ خواردن نابێ› ☰ پیر شدن

**بۆڕان** / bořan/: چاوگ. قۆڕە قۆڕ کردنی ڕەشەوڵاغ ☰ بانگ برآوردن چهارپایان

**بۆڕاندن** / bořandin/: چاوگ. تێپەڕ. //بۆڕاندت؛ دەبۆڕێنی؛ ببۆڕێنە// بۆڕە کردن ☰ ماع کشیدن و عروعر کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: -/ چاوگی نەرێنی: نەبۆڕاندن

**بۆڕبۆڕێن** / bořbořên/: ☜ **بۆڕ[1]**

**بۆڕدراو** / bořd(i)raw/: ئاوەڵناو. بەزیو؛ ترساو ☰ شکست‌خورده

**بۆڕنای** / bořnay/: چاوگ. بۆڕەبۆڕ کردن ☰ صدای ناخوشایند درآوردن

**بۆڕە** / boře/: دەنگەناو. ١. دەنگی بەرزی گا و گۆل ٢. دەنگی بەرز و ناحەزی گریان ٣. دەنگی گڕ و بەرز ‹بۆڕەی ماشین مێشکی بردم!› ☰ ١. صدای گاو و گوساله ٢. های ـهای ناخوشایند گریه ٣. صدای بم بلند

**بۆڕەبۆڕ** / bořebor/: دەنگەناو. ١. دەنگی زۆری گا و گۆل ٢. دەنگی زۆر و ناحەزی گریان ‹هۆقەهۆق و بۆڕەبۆڕ/ حیلەی جانوو، ئەسپی تۆڕ «هێمن»› ☰ ١. صدای مُمتد گاو و گوساله ٢. های ـهای مداوم و ناخوشایند گریه

**بۆڕی** / bořî/: ناو. ١. کەڕەنا؛ شەیپوور ٢. دووکەڵکێشی سەماوەر ☰ ١. کرنا ٢. دودکش سماور

**بۆڕیایۆ** / bořyayo/: چاوگ. کەوتنە بۆڕە ☰ صدای ناخوشایند درآوردن

**بۆڕیژەن** / bořîjen/: ☜ **بۆڕیەژەن**

**بۆڕین** / bořîn/: چاوگ. ١. هەڵگەڕانی تەوشی وەک شیر و... ٢. بۆڕاندنی گا و گوێلک ☰ ١. فاسد شدن مایعاتی از قبیل شیر و ... ٢. صدا درآوردن گاو و گوساله

**بۆڕیە** / bořye/: ناو. ١. کەڕەنا؛ شەیپوور ٢. مزرەقی ناوهۆڵۆڵ ☰ ١. شیپور ٢. گردنای میان‌تهی

**بۆڕیەژەن** / bořyejen/: ناو. بۆڕیژەن؛ کەڕەناچی؛ کەڕەناژەن؛ شەیپوورچی ☰ شیپورچی

**بۆڕێن** / bořên/: ناو. کێبەرکێ؛ ڕکە؛ ملە ☰ مسابقه

**بۆز[1]** / boz/: ناو. نەخۆشی چۆکی ئاژەڵ ☰ بیماری زانوی دام

**بۆز[2]**: ئاوەڵناو. بۆزە: ١. شینی ئاماڵ‌سپی ‹ڕێگام

نیشان ده پادشای بوزورک!/ گورگی بـۆزت کـرد بـه دەلیل بۆ تـورک! «پیرەمێـرد»› ٢. ڕەنگـی ڕیشـی ماش و برنجی؛ سپی و ڕەش تێکەڵ ‹تووکی سەر و ڕیشم لـه غـەما بـۆز و درێـژ بـوو/ بـەم وەزعیـەتی ڕیشـەوە وەک خواجـه حـەنا خـۆم «عـارف»› ٣. نەخۆشی چۆکی ئاژەڵ ≡ ١. کبود ٢. جوگنـدمی ٣. بیماری زانوی دام

**بۆزقـاجی / bozqacî**/: ئاوەڵناو. بۆز و خەت ـخـەت (بـۆ حـەیوان) ≡ خاکسـتری بـا خـط و خـال سـفید (حیوان)

**بۆزە / boze**/: ☜ **بۆز**[٢]

**بۆزەن / bozen**/: ئاوەڵناو. بۆنکـەر؛ زۆر بـه بـۆن ≡ دارای شامەی قوی

**بۆژان / bojan**/: ☜ **بۆژانە**

**بۆژانە / bojane**/: ناو. بووژانە؛ بۆژان؛ بۆژنە؛ بیـژان؛ بێژەن؛ بێژان؛ بیویژان؛ نـۆویژان؛ ژابێـژ؛ بیڤـیژان؛ بۆریژانگ؛ ئـەنیژ؛ بۆعـەترە؛ بوومـاران؛ بۆمـایران؛ بوومـاروو؛ بۆمارانـە؛ گوڵـەمارانێ؛ گوڵەهەسـێل؛ زەردە شابەنگ؛ بنـەگیای خۆڕسـکی گـەڵادرێژ و تووکن بە بـۆنێکی زۆر تونـدەوە کـە بـۆ دەرمـان دەبـێ ‹چنـوور تازیـەبار بۆژانـە خـەمبار/ ئێسـاڵ کۆچەکەت نەلوانۆ هەوار «فولکلۆر»› ≡ بومادران

**بۆژنە / bojne**/: ☜ **بۆژانە**

**بۆژۆ**[١] **/ bojo**/: ناو. ١. بـۆژە؛ بـواژوو؛ بۆگـە؛ گیـای بۆنگرتوو کـە مـاڵات نـایخوا ٢. ☜ **بـوزو** ≡ ١. علف بوگرفته ٢. ☜ **بوزو**

**بۆژۆ**[٢]: ئاوەڵناو. بۆژە؛ بۆنگرتوو ‹گوڵستان و زەمەندی کوردەواری/ بە پێـی دوژمـن دەبـوو پێشـێل و بـۆژۆ «هێمن»› ≡ بوگرفته

**بۆژە**[١] **/ boje**/: ☜ **بۆژۆ**[١]**ـ١**

**بۆژە**[٢]: ☜ **بۆژۆ**[٢]

⊡ **بۆژە کردن**: ١. بێز کردنی حەیوان لە گیای بۆژۆ ٢. دەم دانی حـەیوان بـە گیـا و ئالـفەوە کـە دەبێتە هۆی ئەوەی پاشماوەکەی نەخۆن ≡ ١. اِبا کردن دام از خوردن علف بوزده ٢. بوزده کـردن علوفه

**بۆژیاگ / bojyag**/: ئاوەڵناو. گلۆف؛ مچۆڵە ≡ مُچاله

**بۆس**[١] **/ bos**/: ناو. ١. ☜ **بست ـ١** ٢. ماچ؛ ماچە؛ ڕامووسانک ≡ ١. ☜ **بست ـ١** ٢. بوسه

• **بۆس**[٢]: پاشەوشە. ماچکەر ‹ئاستانەبۆس؛ پـابۆس› ≡ ـ بوُس

**بۆسار / bosar**/: ئاوەڵناو. بۆسارد؛ بۆنگرتوو؛ تـام و بۆ گۆڕیاگ ‹گۆشتەکە تەواو بۆسار بووە› ≡ بوگرفته

**بۆسارد / bosard**/: ☜ **بۆسار**

**بۆسان / bosan**/: ناو. بێستان؛ باخ ≡ بوستان

⊡ **بۆسار بون**: گنخان؛ بۆن گرتن ≡ بو گرفتن

**بۆسای / bosay**/: چاوگ. ڕامووسـان؛ مـاچ کـردن ‹بۆسا دوو دیدە و پێشانی پاکش/ بی وە شەفای دەرد دڵەی غەمناکش «خانای قوبادی»› ≡ بوسیدن

**بۆست / bost**/: ☜ **بست ـ١**

**بۆسۆ / boso**/: ناو. بێسۆ؛ بۆنسۆ: ١. بـۆنی لۆکـەی سووتاو ٢. پەڕۆی تازە سووتاو کە لە سەر بـرینی تازەی دەنێن خوێنەکـەی دەبەسـتێ ≡ ١. بـوی پنبەی سوخته ٢. تکه پارچەی پنبەای که می سوزانند و بر زخم تازه می گذارند تا خون را بند آورد

⊡ **بۆسۆ کردن**: *[مەجاز]* بوختان کردن ≡ تهمت زدن

**بۆسۆ لێ هەڵنەسان**: *[کینایە]* بۆسـۆ لـێ نـەهاتن؛ ڕووت و قووت و هەژار و نـەدار بـوون ‹هێنـدە هـەژارە، بیخـە تـەنوور بۆسـۆی لـێ هەڵناسـێ «مەسەل»› ≡ لخت و عور بودن

**بۆسۆ لێ نەهاتن**: ☜ **بۆسۆ لێ هەڵنەسان**

**بۆسە / bose**/: ناو. بووسـە: ١. حەشـارگە؛ سـیپە؛ ڕەبەت؛ کـەمین؛ مـردە و زینـدە ٢. مـەڵاس ٣. قایشی گرێدەری نیر و ئاموور پێکەوە ٤. ماچ ‹تـا لە من ئەو زوڵفە ڕێی بۆسـە و کـەناری گرتـووە/ نـاو دەمم بێ شوبهە تامی زەهری ماری گرتووە «نـالی»›

🇮🇷 ١. کمینگاه ٢. کمین ٣. رابط بین یوغ و خیش ۴. بوسه

⊡ **بۆسە خواردن:** خۆ لە بۆسە نان؛ لە بۆسەدا خۆ مات کردن 🇮🇷 کمین گرفتن

**بۆسە گرتن:** بۆسە خواردن 🇮🇷 کمین گرفتن

**بۆسە نانەوە:** لە بۆسەدا دانیشتن ‹ڕۆژگاری سپڵە بۆ من بۆسەیەکی نایەوە/ نەمدی هەر تیرێکی دەیهاوێ بەرەو سینەم نەبێ «هێمن»› 🇮🇷 کمین کردن

**بۆسە دانانەوە:** بۆ نیازێکی، زۆرتر چەوت و ناڕەوا، ماتە لە خۆ دان 🇮🇷 برای هدفی، بیشتر ناپسند، منتظر فرصت بودن

**خۆ لە بۆسە نان:** ☜ **بۆسە خواردن**

**بۆسەلی** / boselî/: ناو. جۆرێ ترێ 🇮🇷 نوعی انگور

**بۆش**¹ / boş/: ناو. تێکەڵ ـپێکەڵی خەڵک 🇮🇷 شلوغی مردم؛ ازدحام

**بۆش**²: ئاوەڵناو. ١. ناوبەتاڵ؛ کلۆر؛ هڵۆڵ ‹سەیرە هەرکەس ڕوو دەکاتە ئەم خەراباتی وجوود/ کاسەکەی هەرچەندە پڕتر بێ ئەوەندە بۆشترە «حەمدی»› ٢. زۆر؛ فرە؛ زەحف ‹بەلام گیانەکەم ماددەی تۆ بۆشە/ لە تێکەڵیدا هەر ڕاستی خۆشە «پیرەمێرد»› 🇮🇷 ١. کاواک؛ تُهی ٢. بسیار

**بۆشایی** / boşayî/: ناو. ١. چۆڵایی؛ بەتاڵایی؛ والایی؛ شوێنێ کە هیچ ماکێکی تێدا نەبێ ٢. مەودا؛ نێوان ‹بۆشایی نێوان پیتەکان زۆرە› 🇮🇷 ١. خلأ ٢. فاصله

**بۆشتاخ** / boştax/: ئاوەڵناو. بۆشناغ؛ کۆک و پۆشتە ‹خۆ خۆشە جوان و بۆشتاخ بێ کۆمەڵ/ بەلام نەک بڕێ و باقی تر ڕووتەڵ «کاک ئەحمەد»› 🇮🇷 شیکپوش

**بۆشکە** / boşke/: ☜ بەرمیل

**بۆشناغ** / boşnağ/: ئاوەڵناو. کۆک و پۆشتە 🇮🇷 شیکپوش

**بۆشی** / boşî/: ناو. بۆیرش؛ بۆنم 🇮🇷 بوی نم

**بۆعەترە** / bo'etre/: ☜ بۆژانە

**بۆغ** / boğ/: ☜ بۆق¹ـ٦

**بۆغاڤ** / boğav/: ناو. گیایەکە بە شاخانەوە دەڕوێ 🇮🇷 گیاهی است که بر صخرەها روید

**بۆغمە**¹ / boğme/: ناو. نەخۆشی دووشاخە 🇮🇷 بیماری خُناق

**بۆغمە**²: سارستە. وس بە؛ دەمت بگرە 🇮🇷 ساکت؛ خاموش باش

**بۆفرە** / bofre/: ناو. تۆقلە؛ بلۆق 🇮🇷 حُباب

**بۆفڕە** / bof(i)ře/: ناو. بلق 🇮🇷 حُباب

**بۆق**¹ / boq/: ناو. ١. قرپۆک؛ بەق؛ قورواق؛ قربۆق ‹شەو نییە خەومان لەبەر قرژاڵ و بۆق و ژاوەژاو! «نالی»› ٢. کەڵەشاخ بۆ تێ‌تووڕاندن ٣. پشت مل ‹دایە بۆق ملیا!› ٤. پاڵ؛ دەڵەک ‹بۆقی پێوە نیا، خستی!› ٥. نێرتکی چلە پیاز و سیر ٦. هەڵم؛ بۆخ؛ بۆغ ‹شیشەکان بۆقیان کردگە› ٧. شیشە لامپا 🇮🇷 ١. قورباغه ٢. بوق ٣. پشت گردن ۴. هُل ۵. نرەی پیاز و سیر ۶ بخار ۷. شیشەی چراغ

▣ **بۆق(ی) مل:** بۆقەتە؛ پشتە مل؛ پشتی مل 🇮🇷 پشت گردن

⊡ **بۆق پێوە نان:** پاڵ پێوە نان ‹بۆقی پێوە نا، خستی› 🇮🇷 هل دادن

**بۆق دان:** ١. بۆق لێدان ٢. بۆق نان؛ دەڵەک دان؛ پاڵ پێوە نان 🇮🇷 ١. بوق زدن ٢. هُل دادن

**بۆق نان:** ☜ **بۆق دان ـ٢**

**بۆق**²: ئاوەڵناو. زەق؛ زاق ‹چاوبۆق› 🇮🇷 برجسته

**بۆقژە** / boqije/: ناو. ١. نەخۆشی زاری زارۆکان ٢. قەشمەرە؛ خێزانە مەلێک لە تۆرەمەی ڕەشیشە، ڕەنگاوڕەنگن و دەنگیان خۆشە و بریتین لە بۆقژەی بنەوش و کێوی 🇮🇷 ١. بیماری دهن بچه ٢. طُرقه

**بۆقل** / boqil/: ناو. ماسوولکەی بەلەک 🇮🇷 عضلەی

ساق پا

**بۆقلە / boqle/**: نــاو. قەلەموونـــە؛ بەقلـــەمووت؛ بۆقلەمووت؛ بۆقلەموون؛ بەقلە؛ قەل؛ عەلی‌شـیش ☰ بوقلمون

**بۆقلەموت / boqlemût/**: ☜ بۆقلە

**بۆقلەمون / boqlemûn/**: ☜ بۆقلە

**بۆقلی / boqlî/**: ناو. باقلەکێوی؛ جۆرێ باقلەی ورد ☰ باقلای وحشی

**بۆقە / boqe/**: دەنگەناو. دەنگی نەوی گا کەمتر لە بۆڕە ☰ صدای گاو

**بۆقەتە / boqete/**: ناو. پشتەمل ‹مووی حەوسەد وشتر ئەمکردە جلی/ هێشتا دیار بوو بۆقەتەی ملی «فولکلۆر»› ☰ پشت گردن

**بۆقەمەلە / boqemele/**: ناو. جۆرێ مەلەی وەک بۆق ☰ شنای قورباغه

**بۆکردگ[1] / bokirdig/**: ☜ بۆکردوو

**.بۆکردگ[2]**: پاشەوشە. بۆکراو ‹خوابۆکردگ› ☰ ـساخته

**بۆکردوو / bokirdû/**: ئاوەڵناو. بـۆن‌گرتـوو؛ گنخـاو؛ بۆکردگ ☰ بوگرفته

**بـۆکڕووز / bok(i)řûz/**: نـاو. بـۆنی خـوری یـان ئێسکی سـووتاو ‹هەناسـەی سـیام لـە بۆکـڕووزدا/ بەردی دا بـە ڕۆح بەردولعـەجووزدا «پیرەمێـرد»› ☰ بوی پشم یا استخوان سوخته

**بـۆکز[1] / bokiz/**: نـاو. بـۆنکز؛ بـۆنی سـووتاو ‹بـۆکز ماڵەکەی داگرتبوو› ☰ بوی سوخته

**بۆکز[2]**: ئاوەڵناو. بۆنکز؛ بۆنی سووتاویی لـێ نیشـتوو ‹برنجەکە بۆکز بووە› ☰ بوی سوختگی گرفته

**بۆکسەوات / boksewat/**: نـاو. دۆخـی خلیسـکانی تایـەکانی ماشـین و هەڵسـووڕانی لـە جـێ ☰ بکسوات

**بۆکلیشـە / bok(i)lîşe/**: نــاو. بـــۆنی ناحـــەزی بن‌باخەڵ و قاچ ☰ بوی بد زیربغل و پا

**بـۆک و نـابۆک / bok û nabok/**: ئاوەڵکار. بـە دوو دڵی؛ بە دڕدۆنگی ‹بۆک و نابۆک چوومە پێشێ› ☰ با تردید

**بۆکـۆن / bokon/**: نـاو. ١. ناوسـاجی؛ زرووبی ٢. بۆنی شتی کۆن ☰ ١. نان روغنی ٢. بوی کهنگی

**بۆگنتک / bogintik/**: ناو. بـۆنی میـوەی ڕزیـو ☰ بوی میوه‌ی فاسد شده

**بۆگنخ / boginx/**: ☜ بۆگنخاو

**بۆگنخـاو / boginxaw/**: نـاو. بـۆگنخ؛ بۆگەمرخـە؛ بـۆمچ؛ بۆمچـک؛ بۆمچـە؛ بۆمچـەو؛ بۆمچـەوە؛ بۆمچەوگ؛ بۆی بۆچاڵی؛ بۆنی دانەوێڵەی شـەدار و ڕزیو ☰ بوی نا

**بۆگە / boge/**: ☜ بۆژۆ[1]ـ١

**بۆگەمرخە / bogemirxe/**: ☜ بۆگنخاو

**بۆگەن[1] / bogen/**: ناو. بۆنی پیس ‹داوەستا لەو خـڕ و شیوە/ دووکەڵ و بۆگەنـی بـارووت «هـێمن»› ☰ بوی گند

**بۆگەن[2]**: ئاوەڵناو. خاوەن بۆی گەن و ناخۆش ‹دوور لە ئازادی، لە زیندانی ڕەش و بۆگەندا/ بۆ کەسـانێکی دەژین چڵکن و دزێن دەگریم «هێمن»› ☰ بدبو

**بۆگەنکە / bogenke/**: ناو. ١. فسۆس؛ جانەوەرێکە لە ڕێوی چووکەتر، هیچ جانـەوەرێک لـە ترسـی بۆگەنەکـەی نـاوێرێ تـوخنی کـەوێ ٢. گیـا بۆگەنیوە ٣. سن؛ میرووییەکە بچووکتر لە قالۆنچە ☰ ١. راسو ٢. آقطی ٣. حشره‌ی سن

**بۆگەنە / bogene/**: ناو. کاسەڵەشینکە ☰ سبزقبا

**بۆگەنیو / bogenîw/**: ناو. بۆنی پیس ☰ بوی گند

**بۆگەنیوە / bogenîwe/**: ناو. گیابۆگەنکە ☰ آقطی

**بـۆڵ[1] / boł/**: نـاو. ١. دەنکـی تـرێ؛ گـلار؛ دانـە هەنگوور؛ لبە ترێ ٢. زەنگـی ملـی پێشـەنگ ٣. بوهل؛ گەلی؛ دۆلی تەنگ؛ دەرەی نـاو دوو کێـو ٤. خۆڵەمێش؛ خۆڵـەکەوە؛ مشـکی ٥. هێشـوو؛ هۆشە ☰ ١. دانه‌ی انگور ٢. زنگ کاروان ٣. درّه‌ی تنگ ٤. خاکستر ٥. خوشه

**بۆڵ**[۲]: ئاوەڵناو. ئاوتێزاو ‹ترێ بۆڵ بووە› ≡ آبدار

◙ **بۆڵ بزمارە**: جۆرێ ترێ ≡ نوعی انگور

**بۆڵ مازو**: جۆرێ ترێ ≡ نوعی انگور

**بۆڵانـدن** / bołandin/: چـاوگ. تێـپەر. //بۆڵانـدت؛ دەبۆڵێنی؛ ببۆڵێنە// بۆڵانن؛ بڵماندن؛ بۆڵنای؛ بۆڵە کردن؛ ورتـەورت کـردن؛ وەڕەزی و دڵئێشـاوی خۆ لە ژێر لچەوە دەربڕین ≡ غرولند کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەبۆڵاندن

**بۆڵانن** / bołanin/: ☜ **بۆڵاندن**

**بۆڵژن** / bołjin/: ناو. ناڵە و نەڕەی گەورە ‹دەنگـی دەڵێی بۆڵژنـی دێوە› ≡ ناله و نعرەی بلند

**بۆڵنای** / bołnay/: ☜ **بۆڵاندن**

**بۆڵـە**[۱] / bołe/: نـاو. بـۆر؛ خۆڵەمێشـی؛ مشـکی؛ خۆڵی ≡ خاکستر

**بۆڵە**[۲]: دەنگەناو. ورتە و پرتەی تووڕەیی ≡ غرولند

**بۆڵەبۆڵ** / bołebol/: دەنگەناو. پرتەپرت؛ پرتەوبۆڵە؛ بۆڵەی زۆر ‹بەلام لەگەڵ شـین و شـەپۆڕ و گریـان/ بۆڵەبۆڵی دێوەزمەکە هەر دەهات «هێمن»› ≡ غُرغُر

◙ **بۆڵەبۆڵ کـردن**: لە بەر خۆوە بلمەبلم کـردن ‹چ ڕۆژێکە خوا ئەمرۆ؟ کە هاواری برینـداریم/ نـەوێرم بانگی بـۆ هەڵـدەم؟ بـە بۆڵەبۆڵـی ژێـر لێـو کـەم! «قانع»› ≡ غُرغُر کردن

**بۆڵەبۆڵکەر** / bołebołker/: ☜ **بڵمن**

**بۆڵەتەمێ** / bołetemê/: ☜ **ناڵوبۆڵ**

**بۆڵەمڕ** / bołemiř/: نـاو. ژیلەمۆ؛ ژیلـە ≡ خاکسـتر گرم

**بۆڵەنمە** / bołen(i)me/: ئاوەڵناو. بۆڵـەنمێ؛ بـاری میوەی ئاو تێگـەڕاو. هـەروەها: **بۆڵـەنمە بـوون** ≡ ویژگی میوەی نزدیک به رسیدن

**بۆڵەنمێ** / bołenimê/: ☜ **بۆڵەنمە**

**بۆڵەوپرتـە** / bołe w pirte/: نـاو. لـووتوپـووت؛ لووتەلووت؛ پرتەوبۆڵە ≡ غرولند

**بۆڵی** / bołî/: نـاو. دەنکە ترێ؛ بۆڵ؛ گلار ≡ دانەی انگور

**بۆم** / bom/: ناو. ۱. بومب؛ بۆمبا ۲. سەرزەمین ≡ ۱. بمب ۲. سرزمین؛ بوم

**بۆمارانە** / bomarane/: ☜ **بۆژانە**

**بۆمایران** / bomayran/: ☜ **بۆژانە**

**بۆمبا** / bomba/: ناو. بومب؛ بۆم ≡ بمب

**بۆمبابـاران** / bombabaran/: ☜ **بۆمباران**

**بۆمبـاران** / bombaran/: ناو. بوردوومان؛ بۆمبابـاران؛ کاری بۆمبا داڕژتن ≡ بمباران

**بۆمبـاوێژ** / bombawêj/: ☜ **بۆمباهاوێژ**

**بۆمباهـاوێژ** / bombahawêj/: نـاو. بۆمبـاوێژ؛ فڕۆکەی جەنگی بۆمباهەڵگر ≡ بمب‌افکن

**بۆمچ** / bomiç/: ☜ **بۆگنخاو**

**بۆمچک** / bom(i)çik/: ☜ **بۆگنخاو**

**بۆمچە** / bom(i)çe/: ☜ **بۆگنخاو**

**بۆمچەو** / bom(i)çew/: ☜ **بۆگنخاو**

**بۆمچەوگ** / bom(i)çewg/: ☜ **بۆگنخاو**

**بۆمچەوە** / bom(i)çewe/: ☜ **بۆگنخاو**

**بـۆن** / bon/: نـاو. ۱. بـۆ؛ بـوو؛ بـێهن ۲. عـەتر؛ بۆنخۆشی ‹با بەرێ بۆنـی هەلالە و بەیبوون/ ئابڕووی عەتری گوڵی کاشانی «حەقیقی»› ≡ ۱. بو ۲. عطر

◙ **بۆن پێدان**: بۆدانی دانەوێڵە لە سەر ساج ≡ بـو دادن

**بـۆن پێـوەکردن**: ۱. بـۆنی خـۆش بـە لـووت هەڵمژین ۲. بۆ کردن بۆ ناسین ۳. تاو کـردنی مێچکە لە لایەن نێرەوە لە ناو جانەوەراندا ≡ ۱. استشمام کردن ۲. بو کشـیدن بـرای شناسـایی ۳. تلاش کردن گشن در جذب ماده به جفتگیری

**بۆن تێدان**: عەتر تێهەڵسوون ≡ عطر مالیدن

**بـۆن تێکـەوتن**: هـاتنی سـەرەتای پێگەیشـتنی بێستانی گرکە و گندۆرە ≡ آغاز رسیدن میوه در جالیز

**بۆن دانەوە**: بۆن بلاو کردنەوە ≡ بوی پراکندن

**بۆن کردن**: ١. بۆ کردن؛ بیهن کرن ‹ئەو بە تەنیا بۆ گوڵی سەر مێزی بادەی تۆی ئەوێ/ هەر کە جارێ بۆنی کردی، جا گوڵێکی نوێی ئەوێ! «ئەحمەد هەردی»› ٢. گەنین؛ خراپ بوون ٣. /مەجاز/ سەرەتای هەست کردن بە کارێکی نهێنی ☰ ١. بوییدن ٢. گندیدن ٣. بو بردن؛ سرنخ گرفتن

**بۆنی خوێن لێهاتن**: زۆر ترسناک و ناخۆش بوون ☰ بوی خون (از چیزی) آمدن

**بۆنبڕ**[1] / bonbiř/: ناو. بۆچنە ☰ بوگیر

**بۆنبڕ**[2]: ئاوەڵناو. بۆچنە ‹ماکی بۆنبڕ› ☰ بوگیر

**بۆنبڕە** / bonb(i)ře/: ناو. دەرمانی نەخۆشی لە بەر بۆن ☰ داروی مرض بوزدگی

**بۆنچی** / bonçî/: ناو. تانجی ☰ تازی

**بۆنخۆش** / bonxoş/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی شتێ یان کەسێ کە بۆنی خۆشی هەبێ ‹شۆخێ کە یادی ئارەقی بۆنخۆشی لاملی/ قۆلۆنیا وو شووشەیی عەتر و گولاومە «بێخود»› ☰ خوشبو

**بۆنخۆشکە** / bonxoşke/: ناو. ڕێحانە کێوی ☰ ریحان کوهی

**بۆنخۆشکەرە** / bonxoşkere/: ناو. ١. گیایەکی بۆنخۆشە، وشکی دەکەن بۆ ناو جلکان ٢. هەر جۆرە ماکی بۆنخۆش بۆ لابردنی بۆی ناخۆش ☰ ١. گیاهی خوشبو کە خشک کنند، برای خوشبو کردن لباس ٢. خوشبوکننده

**بۆنخۆشی** / bonxoşî/: ناو. ١. دۆخی خۆش و بە دڵ بوونی بۆن ٢. هەر شتی بۆنخۆش ☰ ١. خوشبویی ٢. عطریات

**بۆندار** / bondar/: ئاوەڵناو. بۆدار: ١. خاوەن بۆن ٢. بە بۆنی خۆشەوە ☰ ١. دارای بو ٢. خوشبو

**بۆندان** / bondan/: ناو. بۆدان؛ دەفری چکۆلەی جێ ماکی بۆنخۆش ☰ ظرف عطر

**بۆندڕ** / bondiř/: ☜ **بۆدڕ**

**بۆندوکەڵ** / bondûkeł/: ناو. بۆچڕ؛ بێهنا کادوو ☰ بوی کاه سوخته

**بۆنسۆ** / bonso/: ☜ **بۆسۆ**

**بۆنکادۆ** / bonkado/: ئاوەڵناو. دووکەڵژۆ؛ دووکەڵی؛ دووکەڵاوی ☰ دودی

**بۆنکادو** / bonkadû/: ☜ **بۆدوکەڵ**

**بۆنکز** / bonkiz/: ☜ **بۆکز**

**بۆنکەر** / bonker/: ئاوەڵناو. بۆزەن؛ زۆر بە بۆن ☰ دارای شامەی قوی

**بۆنگ** / bong/: ناو. کاری هەلاڵ دان؛ خۆش کردنی پێست بۆ مەشکە ☰ دباغی پوست برای مشک

⊡ **بۆنگ کردن**: هەلاڵ دان ☰ دباغی کردن

**بۆنگچی** / bongçî/: ناو. ئەوەی پێست خۆش دەکا بۆ مەشکە و ... ☰ دباغ

**بۆنم** / bonim/: ناو. بۆیرش؛ بۆشێ ☰ بوی نم

**بۆنوبەرام** / bon û beram/: ☜ **بۆنوبەرامە**

**بۆنوبەرامە** / bon û berame/: ناو. بۆوبەرامە؛ بۆنوبەرام؛ بۆنی خۆشی بلاوە بوو ‹گریا گوڵێ بۆ گولاو سەر ئاگر نریا/ ئەم بۆنوبەرامەیەم نەبووبا بریا «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ☰ عطر و بو

**بۆنە** / bone/: ناو. بۆنی: ١. هۆ؛ سەبەب؛ سۆنگە ٢. بەهانە؛ بیانوو ٣. هۆکار؛ کاری سەر بە ڕووداوێکی گرینگ یان تایبەت ‹ئەوان لە بۆنەکانی سەری ساڵدا بەشداری دەکەن› ☰ ١. سبب ٢. بهانه ٣. مُناسبت

**بۆنەهاتگ** / bonehatig/: ☜ **بەدبەخت**

**بۆنەهاتو** / bonehatû/: ☜ **بەدبەخت**

**بۆنی** / bonî/: ☜ **بۆنە**

**بۆ و بەرامە** / bo w berame/: ☜ **بۆنوبەرامە**

**بۆون** / bowin/: ☜ **بایر**

**بۆهت** / boht/: ئاوەڵناو. سەڵت؛ بێژن یان مێرد ☰ مجرد

**بۆهەڕنەموت / bohenemût/**: ناو. بۆمچەو ▤ بوی ناخوشایند

**بۆهەڕنەهوت / bohenehût/**: ناو. بۆگەن؛ بـۆگنخ ▤ بوی بسیار بد

**بۆی / boy/**: ناو. گارسۆن؛ شاگرد ▤ گارسون

**بۆیاخ / boyax/**: ناو. بۆیاغ؛ بۆیە؛ واکس؛ ڕەنگی دەرمان ‹کلاشی ناسکی قایم لە پێ کە!/ نە موحتاجی بە بۆیاخ و بە شۆرین «موفتی پێنجوێنی»› ▤ واکس

⊡ **بۆیاخ دان**: ☜ **بۆیە دان**

**بۆیاخ کردن**: ☜ **بۆیە دان**

**بۆیاخچی / boyaxçî/**: ☜ **بۆیەچی**

**بۆیاخکار / boyaxkar/**: ☜ **بۆیەچی**

**بۆیاغ / boyağ/**: ☜ **بۆیاخ**

**بۆیاغچی / boyağçî/**: ناو. ڕەنگکەر؛ کەوش ڕەنگکەرەوە ▤ واکسی

**بۆیرش / boyriş/**: ناو. بۆشێ؛ بۆنم ▤ بوی نم

**بۆیسان / boysan/**: ☜ **بێستان**

**بۆین / boyn/**: ناوەڵناو. ڕازی ▤ قانع

**بۆینباخ / boynbax/**: ناو. کراوات؛ پارچەی ملپێچ و شۆڕەوەبوو ▤ کراوات

**بۆیە**[1] **/ boye/**: ناو. بۆیاغ: ۱. واکس؛ ڕەنگی دەرمان ۲. ڕەنگ؛ ماک یان پێکهاتەیێ کە ڕەنگ دەدا بە شت ▤ ۱. واکس ۲. رنگ

⊡ **بۆیە دان**: بۆیاخ دان؛ بۆیاخ کردن؛ بۆیە کردن: ۱. واکس کردن ۲. ڕەنگ لێدان ▤ ۱. واکس زدن ۲. رنگ کردن

**بۆیە کردن**: ☜ **بۆیە دان**

**بۆیە**[2]: ناوەڵکار. بۆیێ؛ بـۆیی؛ بۆیەککا؛ بۆیەکانێ؛ پەوکێ؛ پەوکەی؛ لە بەر ئەوە؛ بەو هۆیە ‹بۆیە نالەم تێکەڵی نەی کردووە/ شیوەنێکم پێیە نەی نەیکردووە «هێمن»› ▤ از آن رو؛ زیرا

**بۆیەچی / boyeçî/**: ناو. بۆیاخچی؛ بۆیاخکار: ۱. بۆیاغچی؛ کەوش بۆیاخکەر ۲. ڕەنگکار؛ دیوار ڕەنگکەر ▤ ۱. واکسی ۲. نقاش

**بۆیەر / boyer/**: ناو. ڕابردوو ▤ گذشته

**بۆیەکا / boyeka/**: ناوەڵکار. بۆیەکانێ؛ بۆیەکوو؛ بۆیەکوونێ؛ بەو بۆنەوە ▤ زیرا؛ از آن رو

**بۆیەکاری / boyekarî/**: ناو. ڕەنگکاری؛ کاری داپۆشانی ڕووبەرێک بە توێژێ ڕەنگ ▤ نقاشی

**بۆیەکانێ / boyekanê/**: ☜ **بۆیەکا**

**بۆیەککا / boyekka/**: ☜ **بۆیە**[2]

**بۆیەکو / boyekû/**: ☜ **بۆیەکا**

**بۆیەکونێ / boyekûnê/**: ☜ **بۆیەکا**

**بۆیەمە / boyeme/**: ناو. مێزەری گوڵەنگدار ▤ دستار منگولەدار

**بۆیی / boyî/**: ☜ **بۆیە**[2]

**بۆیێ / boyê/**: ☜ **بۆیە**[2]

**بـو / bû/**: نـاو. ۱. بـەهرەی زەوی ۲. باینە؛ بووبووکەرە؛ بۆ؛ بووم؛ بووە؛ بووەکوێرە؛ بووەکەرە؛ کوند؛ کوندەبوو؛ بوبوکەرە ۳. بۆن؛ بۆ ▤ ۱. بهرەی زمین ۲. بوم؛ جغد ۳. بو

**بوبوچک / bûbûçik/**: ناو. پۆپە؛ تاجی فڕندە ▤ تاج پرنده

**بوبوکەرە / bûbûkere/**: ☜ **بو-۲**

**بوبیش / bûbîş/**: ناو. وشکەپەل؛ گیاجاڕی دێم ▤ هرزەگیاه دیم

**بوتگ / bûtig/**: ناو. گەردیلە؛ وردیلە ▤ ذرّە

**بوتەکێ / bûtekê/**: ناو. بووکەسەماکەرە ▤ نوعی عروسک خیمەشب‌بازی

**بوجاڕ / bûcar/**: ناو. بەوەجاڕ؛ کەسێ کە کاری بووجاڕییە ▤ بوجار

**بوجاڕی / bûcarî/**: ناو. کۆسەکاری؛ تەتەڵەکاری؛ کاری پاککردنی گەنم و دانەوێڵەیە ▤ بوجاری

**بوچان / bûçan/**: ☜ **بچکۆڵانە**

**بوچانە / bûçane/**: ☜ **بچکۆڵانە**

**بـوچک / bûçik/:** ئاوەڵناو. بچکـۆک؛ چکۆلـە 🇮🇷 کوچک

**بوچکە / bûçke/:** ئاوەڵناو. بووچـک؛ چکۆلـە 🇮🇷 کوچک

**بوچکەلانە / bûçkelane/:** ☜ **بچکۆلانە**

**بوچکەڵــە / bûçkeḷe/:** ئاوەڵناو. میتۆلانـــە؛ بووچکەلانە؛ بێچوولانە 🇮🇷 کوچولو

**بـوچکی / bûç(i)kî/:** ناو. وردیکـەی؛ گچکـەیی 🇮🇷 کوچکی

**بوچلانە / bûçlane/:** ☜ **بچکۆلانە**

**بوچە / bûçe/:** ☜ **بۆچی**

**بوخێر / bûxêr/:** ناو. هێشـووی چووکـەی تریـی نەگەییو 🇮🇷 خوشەی کوچک و نرسیدەی انگور

**بود / bûd/:** ☜ **بودە**

**بـودڕ / bûdiř/:** نـاو. ڕەهـۆڵ؛ کەنـداڵ؛ کـون و دادڕاوی هـەراو لـە زەوی 🇮🇷 شـکاف و سـوراخ در زمین

**بودە / bûde/:** ئاوەڵناو. دەوڵـەمەند؛ دارا؛ بـوود 🇮🇷 ثروتمند؛ دارا

**بودەڵە[1] / bûdeḷe/:** ناو. کوودەڵە؛ بەچکەی بـەراز 🇮🇷 بچەی خوک و گراز

**بودەڵە[2]:** ئاوەڵناو. ١. بێنموودی تەمـەڵ و بێکـارە (بۆ پیاو دەگوترێ) ٢. گێژ و حۆل 🇮🇷 ١. مرد تنبل و بدترکیب ٢. گیج و منگ

**بودینە / bûdîne/:** ناو. پوونە؛ پنگە؛ پنـگ؛ پونـگ 🇮🇷 پونە

**بور[1] / bûr/:** ناو. ١. ڕەنگـی سـپی ئامـاڵ زەرد ٢. بوار ٣. جۆرێ عارەبانە ٤. بیور 🇮🇷 ١. رنـگ سـفید شکری ٢. گدار ٣. نوعی ارابه ۴. تبر

**بور[2]:** ئاوەڵناو. ١. ☜ **بـایر** ٢. بـە ڕەنگـی سـپی ئاماڵ زەردەوە 🇮🇷 ١. ☜ **بایر** ٢. سفید شکری

**بورا / bûra/:** ناو. ژنبرا؛ برای ژن 🇮🇷 برادرزن

**بوراندن / bûrandin/:** چاوگ. ١. بەخشین و چاو لێ پۆشـین ٢. بهورانـدن؛ تێپـەڕ کـردن؛ ڕەت کردن 🇮🇷 ١. بخشیدن ٢. گذراندن

**بورانەوە / bûranewe/:** چاوگ. تێنەپەڕ. //بوورایەوە؛ دەبوورێیـەوە؛ ببوورێـوە// بوورینـەوە؛ دڵ لـە خـۆ چوون؛ لە سەر خۆ چوون ‹عیسا گەیی بۆ نەخۆشی حەستەم/ بوورایەوە دڵ، گرێ درا دەم «هەژار، مەم و زین»› 🇮🇷 از حال رفتن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: بـووراوەوە/ چـاوگی نـەرێنی: نەبوورانەوە

**بـوراو / bûraw/:** ئاوەڵـناو. ١. بەخشـــراو ٢. لەسەرخۆچوو 🇮🇷 ١. بخشیده شده ٢. بیهوش‌شده

**بوراهی / bûrahî/:** ناو. بـۆرایی: ١. حاڵـەتی بـۆر بوون ٢. تارمایی 🇮🇷 ١. کبودی ٢. شَبَح

**بـوردن / bûrdin/:** چـاوگ. تێنەپەڕ. //ــ دەبـوورێ؛ ببوورە// ١. بەخشـین؛ عـافوو کـردن ٢. ڕابـردن؛ تێپـەڕین ٣. زۆر گەیشـتن و بـڵ بـوونی وەک کاڵـەک و شـووتی 🇮🇷 ١. بخشـودن ٢. گذشـتن ٣. زیاده از حد رسیدن میوەی جالیزی

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: بـووردوو/ چـاوگی نـەرێنی: نەبووردن

**بوردنەوە / bûrd(i)newe/:** چاوگ. بوورانەوە 🇮🇷 از هوش رفتن

**بوردە / bûrde/:** ناو. ڕابردوو؛ ڕابردە 🇮🇷 گذشته

**بـورژان / bûrjan/:** چـاوگ. وەنـەوز دان 🇮🇷 چُـرت زدن

**بورژانـــەوە / bûrjanewe/:** چـــاوگ. تێنەپـــەڕ. //بوورژایەوە؛ دەبوورژێیەوە؛ ببوورژێـوە// وەنـەوز دان 🇮🇷 چُرت زدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: بـووژاوەوە/ چـاوگی نـەرێنی: نەبوورژانەوە

**بورو / bûrû/:** نـاو. سووتەکی ئاور کە لەگەڵ گڕ و دووکەڵ بە حەوادا دەچێ 🇮🇷 اشیاء سوختەی سبک کە با شعله و دود به هوا می‌رود

**بووره / bûre/**: ناوەڵناو. بوور؛ باهێر؛ بایەر؛ بەیتوون؛ کۆدە؛ وشکە؛ تایبەتمەندی زەوینی نەکێڵدراو ‹گای لەڕ بووره‌ی چەن ساڵەی بۆ ناکێڵرێ «پەندی پێشینان»› ☰ بایر

**بووری / bûrî/**: ناو. ڕابردوو ☰ گذشته

**بووریا / bûrya/**: ☜ **بۆریا**

**بوورین / bûrîn/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //ـــ دەبووری؛ ببووره// ١. ڕابردن ٢. عافوو کردن ‹کە بێخود تۆزی داوێنی ئەوان بێ/ ئەشێ یا ڕەب لە تەقسیری ببووری «بێخود»› ☰ ١. گذشتن ٢. عفو کردن؛ بخشیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: بووریو/ چاوگی نەرێنی: نەبوورین

**بوورینەوە / bûrînewe/**: ☜ **بوورانەوە**

**بووڕ / bûř/**: ناو. خۆڵەمێش؛ بووڵ ☰ خاکستر

**بووز / bûz/**: ناو. ١. بڤز؛ دارتۆفانە؛ دارێکە بەرێک دەگرێ پڕیە لە مێشوولە ٢. دۆخی لوان؛ دەست دان ☰ ١. درخت پشه ٢. امکان

⊡ **بووز خواردن** لوان ‹... چۆن بووز دەخوات و بۆی دەلوێ، وەک ئەو پیاوە ساویلکە بێ کە سەروبەری ژیانی لە ناو پەڕاوی پەڕزەردی بە پیوازاو ڕەنگ‌کراوی نووسراوی ئاخووندا دەژیێ؟ «هەژار، *چوار نامیلکە*»› ☰ امکان داشتن؛ مقدور بودن

**بووزخۆر / bûzxor/**: ئاوەڵناو. پەردەژ؛ پەردۆژ ☰ مُمکن

**بووزوو / bûzû/**: ناو. بووزی؛ بۆزۆ؛ شاڵ؛ تەناوی جۆلا لە خوری و مەرەز ‹چیدی دوژمنان بە خوو خۆش مەکەن/ بووزوو و کەپەنک بالاپۆش مەکەن «سەیفی قازی»› ☰ شال دستباف محلی کردستان

⊡ **بووزوو و چرنش کردن** بە تف لکاندن؛ سەروبنی کار هێنانە یەک و لە کۆڵ خستنی ‹کار کردن کوا وا دەبێ؟ هەر بووزوو و چرنشی دەکا و وە لای دەنێ!› ☰ ماست‌مالی کردن

**بووزووتەن / bûzûten/**: ناو. بووزووکەر؛ جۆلا؛ جیلا؛ شاڵباف ☰ جولا؛ بافنده

**بووزووکەر / bûzûker/**: ☜ **بووزووتەن**

**بووزە / bûze/**: ناو. بەستەنی؛ دۆندرمە؛ چلووره ☰ بستنی

**بووزەڵە / bûzełe/**: ناو. بەروانکە؛ پارچە قوماشێ کە لە کاتی مەشکە ژەندندا سنگ و باسکی کابان دادەپۆشێ ☰ پیشبند

**بووزی / bûzî/**: ☜ **بووزوو**

**بووژان / bûjan/**: چاوگ. ١. هەڵدان؛ بە خۆدا هاتن ٢. چا بوونەوە؛ خوەشەو بوون ☰ ١. رشد کردن؛ بالیدن ٢. بهبود یافتن

**بووژاندن / bûjandin/**: چاوگ. ڕەنجاندن؛ ئازار دان ☰ رنجانیدن

**بووژاندنەوە / bûjandinewe/**: چاوگ. ژیاندنەوە ‹کاری نووسەر ئەبێتە بووژاندنەوەی بەهار و گوڵ و سەوزایی و هیوا، نەک دەلالی! «سواره»› ☰ احیا کردن

**بووژانگە / bûjange/**: ناو. جێ سانەوەی نەخۆشی تازە لە جێ هەستاو ☰ استراحتگاه دوره‌ی نقاهت

**بووژانە / bûjane/**: ☜ **بۆژانە**

**بووژانەوە / bûjanewe/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //بووژایەوە؛ دەبووژێیەوە؛ ببووژێوە// ژووژ بوونەوە و ژین وە بەر هاتنەوە پاش شکست و دافەتان ‹جرِ و جانەوەر ژیانەوە و دوژمنانی کوردستانیش، دەگەڵ تینی گەرما، بووژانەوە «هێمن»› ☰ به نشاط آمدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: بووژاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەبووژانەوە

**بووژاوە / bûjawe/**: ئاوەڵناو. ژووژیاگ؛ وەگوڕهاتوو ☰ سرحال آمده

**بووژەڵە / bûjeře/**: ئاوەڵناو. تازەپێ‌گرتوو ‹منداڵەکە تازە بووژەڵە بووە و خلەخل دەڕوا› ☰ نوپا

**بووژێنەر / bûjêner/**: ئاوەڵناو. گیان‌بەژوێن ☰

حیات‌بخش

**بووس** / bûs/: ناو. هەڵم و بۆق؛ هەڵاوی گەرما ☚ هُرم و بخار گرما

**بووسە** / bûse/: ناو. ١. پشوودانێکی کورت ٢. ☜ بۆسە ☚ ١. توقف کوتاه ٢. ☜ بۆسە

**بووشکە** / bûşke/: ☜ بەرمیل

**بووقیان** / bûqyan/: چاوگ. جووڵان ☚ حرکت کردن؛ تکان خوردن

**بووک** / bûk/: ناو. بیک؛ بوویک: ١. وەوی؛ کچ یان ژنێ کە تازە شووی کردووە ٢. وەوی؛ بوویک؛ پەیوەندی ژن لەگەڵ بنەماڵەی مێردیدا ‹ئەم خاتوونە بووکی ئێمەیە› ٣. نیسان؛ هەڵاڵە؛ گوڵاڵەسوورە ٤. بووکەڵە؛ پیاوەدارینە؛ بووکەبارانە ٥. باپشکێو؛ چنچکەسڵاو ٦. پاڵی جگ؛ قاپی لە سەر پاڵ ‹ڕۆژێ بە مورادی منیش ئەڵبەت دەگەڕێ چەرخ/ ئەم میچە قەراری نییە گاهێ جگە گەهێ بووک «شێخ ڕەزا»›. بەرانبەر: جگ ☚ ١. تازەعروس ٢. عروسِ خانوادە ٣. شقایق ٤. مترسک ٥. گُل‌مُژە ٦ حالت بر پهلو افتادەی شتالنگ

**بووکبووکێنە** / bûkbûkêne/: ناو. گاڵتەی منداڵان بە بووکەڵەی لەیستۆک ☚ عروسک‌بازی

**بووکجوانکەر** / bûkc(i)wanker/: ناو. شانەکار ☚ آرایشگر عروس

**بووکک** / bûkik/: ناو. چینچکەسڵاو؛ باپشکێو ☚ گل‌مژە

**بووکڵە** / bûkłe/: ☜ بووکەڵە

**بووکمار** / bûkmar/: ناو. مارژۆک؛ جۆرێ مارمێلکە ☚ نوعی مارمولک

**بووکنی** / bûknî/: ناو. ئەوانەی لە لایەن زاواوە دەڕۆنە ماڵەبووک و لە گەڕانەوەدا بووکیش لەگەڵ خۆیان دێننەوە ☚ کسانی کە از جانب داماد، بە منزل پدر عروس می‌روند و او را با خود برمی‌گردانند

**بووکوزاوا** / bûk û zawa/: ناو. گوڵەمێلاقە ☚ گل لالە

**بووکەباخە** / bûkebaxe/: ناو. بووکەباغە؛ بووکەڵەی پلاستیکی ☚ عروسک پلاستیکی

**بووکەبارانە** / bûkebarane/: ناو. بووکەبارانێ؛ بووکەبەبارانە؛ بووکەبەبارانێ؛ کۆتەڵێ کە منداڵان ئەیگێڕن بە ماڵانەوە، ئاوی پێدا دەکرێ ☚ آدمک چوبی

**بووکەبارانێ** / bûkebaranê/: ☜ بووکەبارانە

**بووکەباغە** / bûkebağe/: ☜ بووکەباخە

**بووکەبەبارانە** / bûkebebarane/: ☜ بووکەبارانە

**بووکەبەبارانێ**/ bûkebebaranê/: ☜ بووکەبارانە

**بووکەبەفرینە** / bûkebefrîne/: ناو. ئەو پەیکەرەی منداڵان بە بەفر دروستی دەکەن ☚ آدم‌برفی

**بووکەرە** / bûkere/: ناو. کوند؛ بایەقوش؛ بوو ☚ جُغد

**بووکەسوورە** / bûkesûre/: ناو. مەلێکە لە تۆرەمەی ڕەشیشە، ١٣,٥ سانتی‌میترە، سینگ و مل و ناوچاوانی نارنجییە، پشتی قاوەیی و بەر زکی سپییە، لە باخ، سەر پەرژین و مێشان دەژی، زستانان زۆر دەکا ☚ سینەسرخ

**بووکەسەماکەرە** / bûkesemakere/: ناو. بووتەکێ ☚ نوعی عروسک خیمه‌شب‌بازی

**بووکەسی** / bûkesî/: ناو. مەلێکە لە تیرەی قاز بەڵام لە هەموویان جوانتر و بچووکترە ☚ عروس غاز

**بووکەشووشە** / bûkeşûşe/: ناو. بووکڵەی لە چینی یان شیشە ☚ عروسک از چینی یا شیشە

**بووکەڵە** / bûkełe/: ناو. بووکڵە؛ بووکیلە؛ بوکلە؛ بەولکان؛ بەبۆکە؛ بووکەواڵا؛ بووکەسەماکەرە؛ بەبۆڵە؛ بیبی؛ بەبلانە؛ کووکلە؛ وەویلە؛ وەویلکە؛ ویلکان؛ وەیلکان؛ بەوولکان؛ بەولە؛ وەوولە؛ وەویە؛ وەیولێ؛ وەیوولە؛ وێول؛ تەتە؛ تەتەبەخێ؛

خلنـزەر؛ بیچبیجەخانم؛ بویکابچویک؛ بووکەباخە؛ جۆرێ لەیستۆک لە شێوەی مرۆ یان گیانـەوەری بچووک ☰ عروسک

**بوکەوالا / bûkewała/**: ☜ **بوکەڵە**

**بوکی / bûkî/**: ☜ **بوکێتی**[۲]

**بوکیلە / bûkîle/**: ☜ **بوکەڵە**

**بـوکێن / bûkên/**: نـاو. بـــووک‌بووکێنـــە ☰ عروسک‌بازی

**بوکێنی**[۱] **/ bûkênî/**: ناو. وەویەتی؛ دۆخـی بـووک بوون ‹کەمەری زیوی چـەم لـە کەمـەردا/ هـەودای بووکێنی تازەی لـە سـەردا «پیرەمێـرد»› ☰ حالـت عروس بودن

**بوکێنی**[۲]: ئاوەڵناو. بووکی؛ پێوەندیدار بـە بووکـەوە ‹کراسی بووکێنی› ☰ مربوط به عروس

**بولەرزە / bûlerze/**: ☜ **بومەلەرزە**

**بولـەرە / bûlere/**: نـاو. بوومەلـــەرزە؛ زەلزەلـــە؛ هەژانی زەمین ☰ زلزله

**بولێڵ / bûlêł/**: ☜ **بولێڵە**

**بولێڵـە / bûlêłe/**: ناو. بوولێڵ: ۱. بوومەلێڵ؛ نێوان شەو و ڕۆژان؛ تاریکی و ڕۆشنایی تێکەڵ لە ئێـوار و بەیاندا ۲. پاش نوێژی شێوان ‹بوولێڵە کە هـات، مەپرسە کەنگێی ساڵە/ مەی فڕ بکـە! لـەخورێنی بـە تاس، بە پیاڵە «هەژار، *چوارینەکانی خـەییام*»› ☰ ۱. گرگ‌ومیش ۲. بعد از غروب

**بـوڵ / bûł/**: نـاو. خۆڵـەمێش؛ مشـکی؛ خۆڵـی ☰ خاکستر

**بـوڵاو / bûław/**: نـاو. خۆڵیـاف؛ مشـکی و ئـاوی لێکدراو ☰ خاکسترآب

**بوڵـدان / bûłdan/**: نـاو. خۆڵـەمێش‌دان ☰ جـای خاکستر

**بوڵەوەرە / bûłewere/**: ناو. تیژاوی خۆڵەمێش کە جانەوەری مێملـی داری پـێ لـە نـاو دەبـەن ☰ تیزاب خاکستر

**بـوڵین / bûłîn/**: ئاوەڵـناو. بـــۆر؛ خۆڵەمێشـــی ☰ خاکستری رنگ

**بـوم / bûm/**: نـاو. ۱. تەشـوێ ۲. ☜ **بوـ**[۲] ۳. زەوی ☰ ۱. تیشه ۲. ☜ **بوـ**[۲] ۳. بوم

**بوماران / bûmaran/**: ☜ **بۆژانە**

**بومارو / bûmarû/**: ☜ **بۆژانە**

**بومەلەرزە / bûmelerze/**: ناو. زەلزەلە؛ بوولـەرزە؛ بوومەلـەرزە؛ بووەلـەرزە؛ بیمەلـەرزە؛ زەولـەرزە؛ بیڤـەلەرز؛ زەمـینلـەرزە؛ لـەرزەک؛ هەردهـەژ؛ لەرەی ناکاوی بەشـێک لـە توێکڵـی زەوی ‹ئـەم کێوانە ئەیانەوێ/ بوومەلەرزە ڕایانژەنێ «شـێرکۆ»› ☰ زلزله

**بومـەلێڵ / bûmelêł/**: نـاو. بوولێڵــە؛ بوومەلێڵــە؛ کاتی تاریک و ڕۆشـنی نێـوان شـەو و ڕۆژان لـە بەیانیان و ئێواراندا ‹خۆشەویستەکەم! لە پەنجەرەی نیوەتاکی بوومەلێڵەوە/ چاوی من لـە دیمـەنی کچـی بەیانییە «سوارە»› ☰ گرگ‌ومیش

**بومەلێڵە / bûmelêłe/**: ☜ **بومەلێڵ**

**بون / bûn/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //بووی؛ دەبی؛ ببە// ۱. هـەبوون ‹بـوون و نـەبوون و مـان و نـەمان تـۆ حەقشـناس!/ جـەبرە و بـە مـەیل دڵـبەرە، کـەی ئیختیارییە؟ «حەقشناس»› ۲. بە شێوازێ دەرهاتن ‹تا شاد نەبم بە مەرحەمەتی کیمیایی تۆ/ بوونـی بـە زەڕ مەحاڵـە مسـی قـەڵبی پڕغەشـم «بێخـود»› ۳. هاتنە دنیا؛ لە دایک بوون ‹بە حەق هەر حـەق، بـە ناحەق ناحەقم وتووە لە ڕۆژێ بووم/ وەکـوو مەنسـوور ئەگەر بیشمکوژن، ناکەم لە حەق لادەم «مـەحوی»› ☰ ۱. بودن ۲. شدن ۳. زادن؛ متولد شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: بوو/ چاوگی نەرێنی: نەبوون

**بـونتاڤ / bûntav/**: ناو. هەورەتریشـقەیێ کـە لـە عەرز دەدا ☰ صاعقه

**بونگ / bûnig/**: ☜ **بیانو**

**بونگلو / bûng(i)lû/**: ☜ **بانگلێر**

**بونەوە / bûnewe/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //بوویەوە؛ دەبیەوە؛ ببەوە// دووبارە پەیدا بوون ☰ دوبارە پیدا شدن
■ ئاوەڵناوی بەرکاری: بووەوە/ چاوگی نەرێنی: نەبوونەوە

**بونەوەر / bûnewer/**: ناو. هەرچی (لە گیانەوەر و بێ‌گیان) هەیە ‹بوونەوەری زیندوو› ☰ موجود

**بووە[1] / bûwe/**: ☜ **بوو-٢**

**بووە[2]**: ئاوەڵناو. دارا؛ دەوڵەمەند؛ بوودە ☰ دارا؛ ثروتمند

**بووەتەقلە / bûweteqle/**: ناو. جۆرە کوندێکی مەزنە ☰ نوعی بوم بزرگ

**بووەتەقڵە / bûweteqłe/**: ناو. کوند؛ بایەقوش؛ بوو ☰ جُغد

**بووەکوێرە / bûwek(i)wêre/**: ☜ **بوو-٢**

**بووەکەرە / bûwekere/**: ☜ **بوو-٢**

**بووەلەرزە / bûwelerze/**: ☜ **بومەلەرزە**

**بوویش / bûwîş/**: ناو. زەمەند و قشلاخی بێ‌ئاو ☰ علفزار بی‌آب

**بوویک / bûwîk/**: ناو. ١. ☜ **بووک -١** ٢. باپشکێو ☰ ١. ☜ **بوک -١** ٢. گل‌مُژە

**بوویکانو / bûykanû/**: ناو. تازەبووک؛ تازەووی ☰ نوعروس

**بوهوراندن / bûhûrandin/**: چاوگ. تێپەڕاندن ☰ گذراندن

**بوهورتن / bûhûrtin/**: چاوگ. تێپەڕین ☰ گذشتن

**بوهیشک / bûhîşk/**: ناو. گوێز؛ بلچ ☰ زالزالک

**بە-[1] / -be/**: پێشگر. ١. خاوەن ‹بەپێز› ٢. زۆر؛ پڕ ‹بەکار؛ بەتین› ☰ ١. با؛ دارای ٢. پُر

**- بە -[2]**: نێوانگر. ١. نیشانەی بەردەوامی و بەرانبەری ‹یەک‌بەیەک؛ دانەبەدانە› ٢. تا؛ لە یەکێکەوە تا ئەوی دی ‹هەتا تۆم ئاشنا بووی ئاشنام بوون/ ئەمێستا مووبەمووم ئەغیارە بێ تۆ «نالی»› ٣. بۆ ‹ساڵ‌بەساڵ؛ مانگ‌بەمانگ› ☰ ١. به ٢. به؛ تا ٣. تا

**بە[3]**: بەند. ١. وێڕای؛ تێکڕای ‹بە ماڵەوە باری کرد› ٢. بۆ دیار کردنی ئامراز ‹بە دار تۆپانیان› ٣. هۆ؛ لە لایەن ‹بە تۆ نایەتەوە؛ بە من بوویە پیاو› ٤. لەگەڵ ‹بە منی بوو؛ با بە من بێ› ٥. لە لای ‹بە شاردا ناڕوا؛ پارەکە بە تۆیە› ٦. لە ئاست؛ لە بەرانبەر ‹بە قانوون قەدەغەیە؛ سێ بە یەک دامانا› ٧. وتەی سوێند ‹بە خوا؛ بە سەری تۆ› ٨. وتەی دژایەتی و بەرەنگاری ‹گوو بە گۆڕت؛ ڕووخا بە هێنووا› ٩. بۆ؛ لایەنی ‹بە ئاسماندا ڕوانین› ١٠. سەر ‹بە زەویدا کوتان› ١١. بیری؛ بۆچوونی ‹بە تۆ بێ دەبێ هەموو قڕ بن!› ١٢. نیشانەی بەرکاری ئامرازدار ‹بەوم سپارد› ١٣. نیشانەی پەیوەندی ‹بە ماڵی ڕاناگا› ١٤. نیشانەی خاوەنداریەتی و هەبوون ‹موحەممەد ئەمینی شێخولیسلام، ناسراو بە هێمن› ☰ ١و٢. با ٣. به کمکِ؛ به وسیلەی ٤. با ٥. نزدِ ٦. طبقِ؛ برابرِ ٧. حرف سوگند ٨. نشانەی تنفر ٩. سوی ١٠. به ١١. اختیار ١٢تا ١٤. به

**بە[4]**: پێشبەند. لە پێش ناوێک و چاوگێک، چاوێکی لێکدراو دروست دەکا (وەک: بە با دان؛ بە باریکدا خستن؛ بە پیرەوە چوون؛ بە جێ مان؛ بە خۆ زانین؛ بە خۆ نازین؛ بە دەست هێنان؛ بە سەر بردن؛ بە کار هێنان؛ بە هیچ نەزانین و سەتان سارستەی تر) ☰ در ابتدای اسم و مصدر، مصدرِ مُرکب می‌سازد

**بەئابرو / be'abřû/**: ئاوەڵناو. ڕووپاک؛ ڕووسپی؛ شەرمدار ☰ آبرومند

**بەئارەزو / be'arezû/**: ئاوەڵناو. بەتاسە ☰ آرزومند

**بەئازار / be'azar/**: ئاوەڵناو. بەژان؛ دەردەدار؛ بەئێش؛ لەژان ☰ دردناک

**بەئازین / be'azîn/**: ئاوەڵناو. خاوەن ڕێ‌وشوێنی تایبەت بۆ ئەنجامی کارێ ☰ دارای سبک

**بەئاسپایی / be'aspayî/**: ئاوەڵکار. هێدی؛ هێدیکا؛

یەواش 🇮🇷 یواشکی

**بەئاستەم** / be'astem/: ئاوەڵکار. ١. بەحاڵ؛ زۆر بە سەبر ‹بە ئاستەم دەسرتێنمە گویت: جگەرگۆشەم! «پەشێو»› ٢. یەکجار کەم 🇮🇷 ١. خیلی آهسته ٢. خیلی کم

**بەئاکار** / be'akar/: ئاوەڵناو. ١. ڕەوشتجوان ٢. ماقووڵ و سەنگین 🇮🇷 ١. خوش‌اخلاق ٢. متین

**بەئاگا** / be'aga/: ئاوەڵناو. ١. خاوەن خەبەر ٢. نەخەوتوو؛ بێدار 🇮🇷 ١. باخبر ٢. بیدار

⊡ **بەئاگا هاتن**: لە خەو هەستان؛ وشیار بوون؛ خەوەر بوونەوە 🇮🇷 از خواب بیدار شدن

**بەئاگایی** / be'agayî/: ناو. وشیاری؛ بێداری 🇮🇷 بیداری

**بەئاڵۆش** / be'ałoş/: ئاوەڵناو. ئاڵۆشاوی؛ ئاڵۆشدار 🇮🇷 حشری

**بەئامانج** / be'amanc/: ئاوەڵناو. خاوەن ئارمان و هیوای گەیشتن بە ئاوات 🇮🇷 هدفدار

**بەئاوات** / be'awat/: ئاوەڵناو. بەرهێڤی؛ تاسەبار؛ چاولەدوو؛ داڤەگر؛ هیوادار 🇮🇷 آرزومند

**بەئاوەز** / be'awez/: ئاوەڵناو. ئاقڵ؛ ژیر؛ عەقڵدار؛ مەژودار 🇮🇷 عاقل

**بەئاین‌وئۆین** / be'ayn û 'oyn/: ئاوەڵناو. تیتاڵباز؛ نازونووزکەر 🇮🇷 اطواری

**بەئجاندن** / be'candin/: چاوگ. هان دان 🇮🇷 تحریک کردن

**بەئجین** / be'cîn/: چاوگ. تووڕەیی دامرکان 🇮🇷 آرام شدن

**بەئۆک** / be'ok/: ئاوەڵناو. ناشیرینی پیاوترسێن؛ زەبەلاحی ناقۆلا ‹هەوایەکی کەتەی بەئۆکی لەخۆبایی، بۆنی دەم سیراوی/ کوتوپڕ هات و کوودەتایەکی زەردی ئەلەکترۆنی بەرپا کرد «شێرکۆ»› 🇮🇷 لندهورِ بدترکیب

**بەئەدەب** / be'edeb/: ئاوەڵناو. زمان‌پاک 🇮🇷 مؤدب

**بەئەزموون** / be'ezmûn/: ئاوەڵناو. چاوکراوە و خاوەن ئەزموون 🇮🇷 باتجربه؛ کارآزموده

**بەئەمەگ** / be'emeg/: ئاوەڵناو. بەینەتدار 🇮🇷 وفادار

**بەئیش** / be'îş/: ئاوەڵناو. خەریکی کار 🇮🇷 شاغِل

**بەئیفاقە** / be'îfaqe/: ئاوەڵناو. چارەساز؛ چارەسەرکەر 🇮🇷 چارەساز

**بەئێش** / be'êş/: ئاوەڵناو. بەژان؛ بەئازار؛ ئێشدار 🇮🇷 دردناک

**بەبا**[1] / beba/: ئاوەڵناو. ١. باگر؛ تایبەتمەندی شوێنێ کە با دەیگرێ ٢. بابۆ؛ وەبا؛ نێرخواز 🇮🇷 ١. بادگیر ٢. گُشن‌خواه

**بەبا**[2]: ئاوەڵکار. بەرباد؛ بەربا؛ بێ‌زەلەت؛ لە تێداچوون و نەماندا 🇮🇷 برباد

⊡ **بەبا دان**: فەوتاندن؛ تێدا بردن؛ لە ناو بردن ‹شەو و ڕۆژ هەر لە فیکری زاری تۆدام/ بە هیچچێ عومری شیرینم بەبا دا! «وەفایی»› 🇮🇷 برباد دادن

**. بەبا**[3]: پاشەوشە. بابردوو ‹تا کەی وا بم؟ تا کەی وا بم؟/ دەس‌بەتاڵ و ڕەنج‌بەبا بم؟ «هێمن»› 🇮🇷 باد بُرده

**بەباڤ** / bebav/: ئاوەڵناو. بادراو؛ کرژ 🇮🇷 ریسیدەشده

**بەباوەڕ** / bebaweř/: ☜ **باوەڕمەند**

**بەبایەخ** / bebayex/: ☜ **بەنرخ**

**بەبر** / beb(i)r/: ناو. بەور 🇮🇷 ببر

**بەبرەو** / beb(i)rew/: ئاوەڵناو. ڕایج؛ باو؛ لەباو 🇮🇷 رایج

**بەبریقە** / beb(i)rîqe/: ئاوەڵناو. بەلۆق؛ بریکەدار؛ چلڤۆک؛ خەڕرا 🇮🇷 براق

**بەبڕ**[1] / bebiř/: ئاوەڵناو. بەبڕشت؛ کارا؛ کارامە؛ کارامەد: ١. بەزاکوون؛ بەکار؛ بەدەست؛ خاراو؛ زانەڤان؛ چنگە؛ بەتوانا لە ئەنجامدانی کاردا ‹ئەم کرێکارە یەکجار بەبڕە› ٢. بەکەڵ؛ بەکەڵک؛ کارکۆ؛ شیاو بۆ ئەنجامدانی کارێک ‹کەرستەی بەبڕ› 🇮🇷 ١. کارآمد ٢. کاری

**بەبڕ**[2]: ☜ **بەبڕە**

**بەبڕست / beb(i)řist/**: ئاوەڵناو. نەفس‌پێت؛ هێمن؛ بین‌فرەھ ▤ شکیبا

**بەبڕشت / beb(i)řişt/**: ئاوەڵناو. ١. بەبڕ؛ زۆر بەکار و کار لە دەست هاتوو ٢. نەخت؛ تایبەتمەندی زەوی بە پیت و ڕێژەو ٣. بەوەج ٤. دەسەلاتدار ▤ ١. کارآمد ٢. حاصلخیز ٣. مُعتبر ۴. مُقتدر

**بەبڕوبیانوو / bebiř û b(i)yanû/**: ئاوەڵناو. لەچەر؛ پەلپ‌گر ▤ بهانه‌گیر

**بەبڕە / beb(i)ře/**: ئاوەڵکار. بەبڕ: ١. کونتەرات ٢. بەگۆترە ▤ ١. کنتراتی ٢. فلّەای

**بەبک / bebik/**: ناو. منالی ساوا ▤ نوزاد

**بەبلانە / beblane/**: ☜ **بووکەڵە**

**بەبلە / beble/**: ناو. ١. تۆل؛ پیزە؛ پز؛ بێچوو لە ناو زگدا ٢. ساوا؛ منالی چکۆلە ▤ ١. جنین ٢. نوزاد

**بەبلیبەبان / beblîbeban/**: ناو. منالی ساوا ▤ نوزاد

**بەبن / bebin/**: ئاوەڵناو. ١. ڕیشەدار؛ بەرەھ؛ ڕەگدار ٢. *[سەرزارەکی]* کچ؛ کەنشک؛ کەنیشک؛ کەنیک؛ کنا؛ کناچێ؛ کچکا؛ دۆت؛ تایبەتمەندی کچێ کە کچێنی نەچووبێ ٣. تایبەتمەندی گیای بە سەلک ▤ ١. ریشه‌دار ٢. باکره؛ دوشیزه ٣. پیازدار (گیاه)

**بەبۆکە / beboke/**: ☜ **بووکەڵە**

**بەبۆڵە / bebołe/**: ☜ **بووکەڵە**

**بەبۆڵەبۆڵ / bebołeboł/**: ئاوەڵناو. مەڕۆزن ▤ غُرغُرو

**بەبە / bebe/**: ناو. ١. منالی ساوا ٢. بیبیلەی چاو ▤ ١. نوزاد ٢. مردمک

**بەبەر / beber/**: ئاوەڵناو. ١. بەردار؛ بە میوە؛ بە بەهرە ٢. بەرپان ▤ ١. مُثمر ٢. عریض

**بەبەران / beberan/**: ئاوەڵناو. بەران‌خواز (مەڕ) ▤ قوچ‌خواه (گوسفند)

**بەبەز / bebez/**: ئاوەڵناو. ١. بێهن‌درێژ ٢. قەڵەو؛ چاخ ▤ ١. پرنفس ٢. چاق

**بەبەغە / bebeğe/**: ناو. بەرخەبەبە؛ بەرچێلە ▤ غبغب

**بەبەکە / bebeke/**: ناو. وەوە؛ بەبە؛ منالی ساوا ▤ نوزاد؛ نی‌نی

**بەبەڵگە / bebełge/**: ☜ **بەڵگەدار**

**بەبەهانە / bebehane/**: ☜ **بیانووگر**

**بەبەهرە / bebehre/**: ئاوەڵناو. بەفەڕ؛ بەکەڵک ▤ بهره‌مند

**بەبیانوو / beb(i)yanû/**: ☜ **بیانووگر**

**بەبیر / bebîr/**: ئاوەڵناو. بیرا؛ خاوەن‌بیر ‹خوێنی لاوانی بەبیر و بروا/ هەر دەبێ بڕژێ، بە فیڕۆ بڕوا؟ «هێمن»› ▤ هوشمند؛ متفکر

**بەبێ / bebê/**: ئامراز. بێ؛ واتەی نەرێنی ‹بەبێ بەزمی حوزووری تۆ حەرامم کردووە بادە/ نەوەک بشکێ بە نەشئەی مەی، خوماریی دەردی بێ‌تۆیی «مەحوی»› ▤ بی؛ بدون

**بەپا / bepa/**: ئاوەڵناو. ١. بەرپا؛ دامەزراو ٢. بەلەپا؛ لەزگین؛ خۆشڕەو ▤ ١. برپا ٢. تیزپا

⊡ **بەپا بوون**: دامەزران؛ هاتنە ئاراوە ‹لە کوردستان گەلێک شۆڕش بەپا بوون/ کوڕی کوردی بە گژ بێگانەدا چوون «هێمن»› ▤ برپا شدن

**بەپانەوە / bepanewe/**: ئاوەڵکار. ١. بە تەواوی ٢. ڕک و ڕاس ▤ ١. به تمامی ٢. به صراحت

**بەپرتاو / bepiřtaw/**: ئاوەڵکار. زۆر توند و تیژانە ‹هێندێک چەکە_چەک بڕێک بە پرتاو/ بەو بەزم و هەرایە گەیینە جێ ڕاو «هەژار، *مەم و زین*»› ▤ سریع

**بەپشت / bepişt/**: ئاوەڵناو. ١. پتەو؛ قایم ٢. *[مەجاز]* خاوەن داژدار و پشتیوان ٣. لێهاتوو لە سەرجێییدا ٤. *[پلار]* قووندەر؛ کوونی ▤ ١. مُحکم ٢. پُشت‌گرم ٣. دارای توانایی جنسی ۴. کونی

**بەپشوو / bep(i)şû/**: ئاوەڵناو. هێمن؛ لەسەرخۆ؛

نەفەس‌درێژ = آرام؛ شکیبا

**بەپۆز** / bepoz/: ئاوەڵناو. فیزن؛ لەخۆبایی = مغرور

**بەپەلک** / bepel(i)k/: ئاوەڵناو. گەڵادار؛ خاوەن گەڵا = دارای برگ

**بەپەلە** / bepele/: ئاوەڵکار. پەلەپەل؛ بە خیرایی ‹گیانی خۆیان بەخت دەکەن بەپەلە/ بانگ دەکەن وەرنە پێشێ، ڕۆژی هەلە «ئاوات»› = با عجلە

**بەپەڵە** / bepele/: ئاوەڵناو. لەکەدار؛ لەکەین؛ پەڵاوی = لکّەدار

**بەپەیا** / bepeya/: ئاوەڵکار. بەپێ؛ بەپێیان؛ پیادە؛ بەبێ سواری ‹هێندێک بەپەیا دەچوونە باخان/ سواران دەگەڕان لە کێو و شاخان «هەژار، *مەم و زین*»› = پیادە

**بەپیلە** / bepîle/: ئاوەڵناو. تەشقەڵەباز؛ گڕنەگر؛ بەهانەگیر = بهانەجو

**بەپێ**[1] / bepê/: ئاوەڵناو. ١. *[مەجاز]* قۆچاغ؛ خۆشڕۆ؛ شاتر؛ خۆشبەز؛ بلەز ل ریڤە چوونێ ‹ژنی کورد زۆر بەپێن› ٢. خاوەن پێ = ١. بادپا ٢. دارای پا

**بەپێ**[2]: ئاوەڵکار. بە پێیان؛ وە پا ‹بەپێ هاتم› = پیادە

**بەپێچ** / bepêç/: ئاوەڵناو. ١. لە دەروونەدا وریا و فێڵباز ٢. پێچدار = ١. تودار ٢. دارای پیچ

**بەپێڵ** / bepêl/: ئاوەڵناو. شەپۆلدار؛ شەپۆلاوی = مَوّاج

**بەپێوە** / bepêwe/: ئاوەڵناو. ڕاوەستاو؛ سەکنی؛ ڕاوێستاو = استوار

**بەپێیان** / bepêyan/: ☜ **بەپەیا**

**بەت**[1] / bet/: ناو. مراوی = مُرغابی

**بەت**[2]: ئاوەڵناو. بێ‌ئەزموون؛ کاڵ = بی‌تجربە

**بەتات** / betat/: ناو. ١. درۆ ٢. دووڕوویی = ١. دروغ ٢. ریا

**بەتار**[1] / betar/: ناو. هەتەر: ١. حوکمی چاو ٢. ڕۆشنایی و بینایی چاو = ١. مسافت دید ٢. بینایی

**بەتار**[2]: ئاوەڵناو. کلۆڵ؛ بەدبەخت = بدبخت

**بەتاراڤک** / betaravik/: ئاوەڵناو. نقوم‌بوو (پاپۆڕ و گەمی) لە ئاودا؛ ژێر ئاوەوە بوو = غرق‌شده

**بەتارە** / betare/: ناو. ١. فلچە؛ گزکچە؛ ئەو گەسکەی جۆلا بووزووی پێ چڕیش دەدا ٢. گوڵەنگ = ١. فرچەی سریش‌زنی جولا ٢. منگولە

**بەتاسە** / betase/: ئاوەڵناو. بێ‌تاقەت؛ تاسەبار؛ داڤەگر؛ دڵبەستە؛ مشتاق؛ کاسۆتی = مشتاق

**بەتاق**[1] / betaq/: ناو. کەمەی سەر دیوار و گونبەز؛ سەردەرک و گونبەزی تاق لێ دراو = تاق و گنبد

**بەتاق**[2]: ئاوەڵناو. ئاواڵە؛ کراوە؛ ڤەکری = گشادە؛ باز

**بەتاق**[3]: ئاوەڵکار. تەنیا ‹کەوی پاردەی ئالمەڵوو/ بەتاق دەخوێنن دوودوو «گۆرانی فولکلۆر»› = تنها

**بەتاقە** / betaqe/: ناو. بلێت؛ بلیت؛ پسوولە؛ پەتە = بلیت

**بەتاقەت** / betaqet/: ئاوەڵناو. ١. خاوەن هێز ٢. بە سەبر و حەوسەلە = ١. توانا ٢. شکیبا

**بەتاک**[1] / betak/: ئاوەڵناو. ١. بەتاڵ ٢. ئاواڵە = ١. تُهی ٢. باز

**بەتاک**[2]: ئاوەڵکار. بەتاق؛ تەنیا = تنها

**بەتال** / betal/: ئاوەڵناو. فالا؛ خالی = تُهی

**بەتاڵ** / betał/: ئاوەڵناو. ١. بێ‌ناوەڕۆک؛ والا؛ خالی ‹داوای قەرزم لێ کرد، بە هەموو هێزی خۆی پێنج قرانی دامێ! بە دەستی بەتاڵ و هەناسەی سارد هاتمەوە تەرەغە «هەژار، *چێشتی مجێور*»› ٢. پووچەڵ؛ هەڵوەشاو ‹بە غەمزەی چاوی مەخموورت بەتاڵ بوو/ لە مەشریق تا بە مەغریب، سیحر و جادوو «سالم»› ٣. بێکار ‹براکەم بەتاڵە› = ١. تُهی ٢. باطل ٣. بیکار

▣ **بەتاڵ کردن**: ١. دەس هەڵگرتن لە کار ٢. بێکار کردن ٣. هەڵوەشاندنەوە = ١. دست از کار کشیدن ٢. بیکار کردن ٣. باطل کردن

**بەتالایی** / betałayî/: ناو. بۆشایی؛ والایی = فراغ

**بەتاڵپا / betałpa/**: ئاوەڵناو. *[پلار]* بێکار؛ وێڵگەرد ≚ ولگرد

**بەتاڵپایی / betałpayî/**: ☜ بەرەڵایی ـ١

**بەتاڵوکە / betałûke/**: ئاوەڵکار. بەلەز؛ بەپەلە ≚ با عجله

**بەتاڵی / betalî/**: ناو. ١. بێکاری ٢. پووچی ≚ ١. بیکاری ٢. پوچی

**بەتام / betam/**: ئاوەڵناو. خۆش‌چێژە؛ خۆش لە سەر زمان. بەرانبەر: بێتام ≚ خوشمزه

**بەتاموخوێ / betam û x(i)wê/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* خاوەن مانا و کاکڵی جێ تێرامان ‹هەستی پاک، مێشکی تازە، بیری نوێ/ شیعری پرسۆز، قسەی بەتاموخوێ «هێمن»› ≚ بامعنی

**بەتان / betan/**: ناو. ئاستەر؛ ئاسەر ≚ آستر

**بەتانە / betane/**: ناو. تێکەڵاوی گڵەسپی و ڕۆنی بەزرەک کە وەکوو هەویرێکی لێ دێت، درزی شیشەی پێ دەگرن و دیواری پێ ساف دەکەن ≚ بتونه

**بەتانی / betanî/**: ناو. بەتانیە؛ پەتوو؛ عەدیاڵ؛ ئەبیاڵ؛ پێخەفی چنراوی بێ‌بەر و پشت ≚ پتو

**بەتانیە / betanye/**: ☜ بەتانی

**بەتاو[1] / betaw/**: ئاوەڵناو. گەرم؛ تاودار ‹ئاخۆ ئەلکتریکە شەوی کردە عەینی ڕۆژ؟/ یا خۆ بڵێسەی ئاگری کوورەی بەتاومە «بێخود»› ≚ پُرحرارت

**بەتاو[2]**: ئاوەڵکار. بە پرتاو؛ بەلەز ‹بەتاو هات لەشکری غەم سا لە خۆ ڕۆیشتنێ ئەی دڵ!/ مناڵی زۆرە شادی‌سێنە ئەی مەجنوون بیابانێ «بێخود»› ≚ باعجله

**بەتاوار / betawar/**: ناو. ئاکام؛ دەرەنجام ≚ عاقبت

**بەتایبەت / betaybet/**: ئاوەڵناو. بەدانستە؛ خازما؛ نەخوازە ≚ به ویژه

**بەتایبەتی / betaybetî/**: ئاوەڵکار. گەوشینی ≚ علی‌الخصوص

**بەتر[1] / betir/**: ناو. بەتڵ؛ بەش ‹بەترێکی شەو چووبوو، بوو بە تەقە› ≚ قسمت

**بەتر[2]**: پێشوشە. پەسر؛ پەسەر؛ پەس ‹بەترپێرار› ≚ پس -

**بەترپێر / betirpîr/**: ☜ بەسترپێر

**بەترپێرار / betirpêrar/**: ☜ بەسترپێر

**بەترمە / betirme/**: ناو. بەترومە: ١. کاری هەڵپەرتاوتن؛ بڕینی لکی زیادی دار ٢. پەیوەند ≚ ١. هرس ٢. پیوند درخت

**بەترمەیی / betirmeyî/**: ئاوەڵناو. تێکەڵ؛ پەترۆمە؛ تێکەڵ لە چەند وشە یان چەند شت ≚ مرکب

**بەترومە / bet(i)rume/**: ☜ بەترمە

**بەترووسکە / bet(i)rûske/**: ئاوەڵناو. زەرقی؛ شاهیک ≚ درخشان

**بەترەف / betref/**: ئاوەڵناو. ١. بەتلاو؛ خراپ ٢. بەفیڕۆ؛ لە دەست چوو ٣. ناڵەبار؛ هەڵەشە ‹کابرا ڕژدێکی بەترەفە› ٤. بە دۆخ و چۆنیەتی مەترسیدار و خراپەوە ‹زامێکی بەترەف و ناسۆر «جەلال مەلەکشا»› ≚ ١. ضایع ٢. تباه؛ هدرشده ٣. ناهنجار ۴. وخیم

**بەتری / betrî/**: ناو. چاوێشە ≚ چشم‌درد

**بەترێ / betrê/**: ناو. لەرە؛ لەرزە؛ شەکە ≚ لرزش

**بەتکرییەش / betikr(i)yeş/**: ناو. گۆڕکەنە؛ گۆڕپشکنەک؛ گۆڕکەن؛ گۆڕکەنکە ≚ گورکن

**بەتکەبەش / betkebeş/**: ناو. چوالوو؛ چالگ؛ چالوو؛ چالەکە؛ کوڕمبەش ≚ گورکن

**بەتلین / betlîn/**: چاوگ. ١. تیاچوون؛ تێداچوون ٢. هیلاک بوون ≚ ١. از بین رفتن ٢. خسته شدن

**بەتڵ[1] / betł/**: ناو. بەشێک لە شەو ≚ پاسی از شب

**بەتڵ[2]**: ئاوەڵناو. ١. پاڵەوان و ئازا ٢. ماندوو؛ مانی ≚ ١. قهرمان ٢. خسته

**بەتلان / betłan/**: چاوگ. ١. نەمان؛ لە بەین

چوون ٢. لە کار کەوتن 🇮🇷 ١. از بین رفتن ٢. از کار افتادن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: بەتلاو/ چاوگی نەرێنی: نەبەتلان

**بەتڵاندن / betłandin**/: چاوگ. ١. لە بەین بردن؛ خراو کردن ٢. ونـدا کردن؛ گوم کردن ٣. فەوتاندن؛ لە دەست خۆ دەرکردن 🇮🇷 ١. هدر دادن ٢. گُم کردن ٣. به باد دادن

**بەتڵانە / betłane**/: ناو. پشوو؛ وچان؛ ڕۆژی کار نەکردن 🇮🇷 تعطیلی

**بەتڵاو / betław**/: ئاوەڵناو. بەترەف؛ خراپ 🇮🇷 تباه؛ هدرشده

**بەتڵە / betłe**/: ناو. ١. ساوار ٢. تەپکە؛ داوی مەل 🇮🇷 ١. بلغور ٢. نوعی دام پرنده

**بەتڵی / betłî**/: ئاوەڵناو. ماندوو؛ مانوو؛ مانی؛ مانگ؛ خەستە 🇮🇷 خسته

**بەتڵین / betłîn**/: چاوگ. ماندوو بوون 🇮🇷 خسته شدن

**بەتوندی / betundî**/: ئاوەڵکار. تـن؛ توند؛ بەسەختی؛ جزم 🇮🇷 مُحکم؛ سِفت

**بەتوێ / bet(i)wê**/: ئاوەڵکار. بە یەک؛ بە تەنها 🇮🇷 به تنها

**بەتوێکڵ / bet(i)wêkił**/: ئاوەڵناو. بەتۆکڵ؛ بە هیما؛ بە زیپک و پلار؛ تایبەتمەندی قسە یان نووسراوەیەک کە سەرەڕای واتایەکی ئاشکرا، یەک یان چەند واتای نهێنی، پتر بە پلارەوەشی تێدا خۆ بنوێنێ. (وەک: دۆستی وەک تۆم هەبێ، خەمی دژمنم نییە!) 🇮🇷 کنایه‌آمیز

**بەتۆرە**[1] **/ betore**/: ئاوەڵناو. تێگەیشتوو: ١. زانا ٢. بە ئەدەب 🇮🇷 ١. دانا ٢. مؤدب

**بەتۆرە**[2]: ئاوەڵکار. بە شێواز 🇮🇷 به راه؛ به طریق

**بەتۆکڵ / betokił**/: ☜ **بەتوێکڵ**

**بەتو / betû**/: ناو. ڕەحەتی؛ ڕەحاتی؛ کۆفک؛ ئامرازی تراو لە دەفر کردن 🇮🇷 قیف

**بەتوون / betûn**/: سارستە. چش؛ بە جەهەننەم ‹دەس بەردە لە کۆن و تازە و ترس و هومێد/ دنیا ـ کە نەمام ـ تازەیە یان کۆنە بەتوون «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› 🇮🇷 به درک؛ به جهنم

**بەتوونە / betûne**/: ناو. ١. بەتانە ٢. باتوونە 🇮🇷 ١. بتونه ٢. بابونه

**بەتەچەرمەڵە / beteçermełe**/: ناو. ماسیگرەی دندووک باریک؛ مەلێکی قەراخ ئاوە، ٤٢ سانتیمیترە، دەندووکی سوور و تیژە لاقی سووری تۆخە، سەر پشتی بۆرە و سەر کلکی ڕەشە، زستان زۆر دەکا و هێلانەی لە قەراخ ڕووبارانە 🇮🇷 کاکایی صورتی

**بەتەر**[1] **/ beter**/: ئاوەڵناو. خراپتر؛ خراوتر 🇮🇷 بدتر

**بەتەر**[2]: ئاوەڵکار. خراپتر؛ خراوتر ‹مەجنوون خۆ وێڵ بێ، بەتەر بێ هەردە/ هەر داش بە سەردا چوون ئازیزمەردە «سەیدی»› 🇮🇷 بدتر

**بەتەک / betek**/: ناو. ١. هەوێردە؛ سەمانەک ٢. کوڕکوڕە؛ کووکووکەرە؛ کەت؛ وەتەک؛ قەتێ 🇮🇷 ١. بلدرچین ٢. کوکر

**بەتەگە / betege**/: ئاوەڵناو. نێری‌خواز؛ نێرخواز؛ وە تگە (بزن) 🇮🇷 نرخواه (بُز)

**بەتەڵەب / bêteleb**/: ئاوەڵناو. بەفاڵ؛ وە فاڵ؛ مێچکەی نێرخواز (یەکسم) 🇮🇷 گُشن‌خواه (اُلاغ)

**بەتەما / betema**/: ئاوەڵناو. ١. چاوەڕێ ٢. بەهیوا ‹هەرچەندە لە زیندانی فیراقام وەکوو بیژەن/ بیللا بەتەمای ڕوستەمی دەستانی کوەیتم «بێخود»› ❋ هەروەها: **بەتەما بوون** 🇮🇷 ١. منتظر ٢. امیدوار

**بەتەماح / betemaĥ**/: ئاوەڵناو. چاوچنۆک؛ بەتەماع؛ تەماحکار 🇮🇷 آزمند

**بەتەماع / betema'**/: ☜ **بەتاماح**

**بەتەواوی / betewawî**/: ئاوەڵکار. سافلەساف؛ سەروبەر 🇮🇷 تمام و کمال

**بەتەوس / betews/**: ئاوەڵناو. بە زیپک؛ بە پلار؛ بە تێکوڵ ☰ طعنه‌آمیز

**بەتەووس / betewes/**: سارستە. بە تـوون؛ چـش ☰ بە درک

**بەتیسک / betîsk/**: ئاوەڵـناو. تیسکن؛ تیسک‌درێـژ؛ بە خوری ☰ پشمالو

**بەتین / betîn/**: ئاوەڵناو. داخ ‹گڕی ئاگری سـەبوون بەتینە/ بەرگی ئاسمان بۆ ئێمە شـینە «بێخـود»› ☰ پُرحرارت

**بەتیە / bet(i)ye/**: نـاو. پارچەیـەکی ناسـکە بـۆ عەبای هاوینان ‹بەتیەی کارخانەی ئۆسای بەغدایی/ دروومان وە تای نەی ئاشنایی «مەولەوی»› ☰ نوعی پارچەی نازک برای روپوش تابستانی

**بەتێشت / betêşt/**: ئاوەڵناو. ئاوس ☰ آبستن

**بەجا / beca/**: ئاوەڵناو. گونجاو؛ بەجێ ☰ بجا؛ روا

**بەجگە / bec(i)ge/**: ئـامراز. بێجگە؛ بل؛ جیا لە؛ بـە غەیرەز ☰ بجز

**بـەجۆرێ / becorê/**: ئاوەڵـکار. ١. وەهـا ٢. بەئەندازەیێ ☰ ١. چنان ٢. به اندازه‌ای

**بەجـووج / becûc/**: ئاوەڵـناو./پـلار/ ١. چەنـەباز؛ قسەدرێژ؛ زۆربڵێ؛ فرەوێـژ؛ چەنـەوەر؛ هەڵـەوەڕ؛ چەقەسرۆ ٢. دامێن‌تەڕ؛ داوێن‌پـیس ☰ ١. ژاژخا؛ وراج ٢. تردامن

**بەجەرگ / becerg/**: ئاوەڵناو. ئازا؛ ڕەشید؛ گەڕناس؛ زیخ؛ جامێر؛ نەترس؛ بوێر؛ بەغیرەت؛ دلێر ‹ئەگەر مەردە، بەجەرگە، پاکە سەرباز/ دەبا بێ و من بکا لـەو بەندە دەرباز «هێمن»› ☰ شجاع

**بەجەڕ / beceř/**: ناو. بزماری بە پێچ ☰ میخ‌پیچ

**بەجێ[1] / becê/**: ئاوەڵناو. بەجێگـە؛ پەسـند ‹کـاری بەجێ› ☰ بجا

**بەجێ[2]**: ئامراز. لە جێگەی؛ لە جیاتی ‹تۆ بەجێ مـن بچۆ!› ☰ به جایِ

**تێبینی**: ئەم پیتـە لەگـەڵ چاوگـدا، سارسـتەی فیعلی پێک دێنێ (وەک: بـەجێ گەیانـدن؛ بـەجێ مان؛ بەجێ هاتن؛ بـەجێ هـاوردن؛ بـەجێ هێشـتن؛ بەجێ هێلان؛ بەجێ هێنان؛ و ...)

**بەجێگە[1] / becêge/**: ئاوەڵناو. پەسند ☰ بەجا

**بەجێگە[2]**: ئامراز. لە جیاتی ☰ به جایِ

**بەجێمان / becêman/**: چاوگ. جێمان؛ دواکـەوتن ‹با چرای زانستی هەڵکەین و لە زوڵمەت دەربچـین/ زۆر بەجێ‌مـاوین لـە خەڵـکی، عەیبـە، عـارە، مردنـە «بێکەس»› ☰ واماندن

**بـەجێماو / becêmaw/**: ئاوەڵـناو. دواکـەوتوو ☰ عقب‌مانده

**بەجێ‌وڕێ / becê û řê/**: ئاوەڵکار. ڕێـک‌وپێـک ☰ سنجیده

**بـەجێهێڵراو / becêhêłraw/**: ئاوەڵـناو. مارزیـای؛ تەرک‌کراو ☰ متروک؛ مهجور

**بەچ / beç/**: ناو. ١. بێچوو؛ بەچکە؛ بـەچک؛ زا ٢. شڵخەمێش؛ پوورەی هەنگ ٣. کۆمەکی لە بـرێ کایە (وەک: کێل و بـەرد)دا، کە ئەگەر لایـەنێ لـە کایەکەران نیوەنەفەرێکی کەم بێ یا خۆ هێندێک لاواز بێ ‹ئێمە دوانی و تۆش بـەچێکت هـەبێ!› ☰ ١. بچه ٢. نسل تازه‌ی زنبور عسل ٣. کمکِ بازی

◘ **بەچ دان**: زاوزێ کردن (مێروو) ‹هەنگەکە بـەچی داوە› ☰ زاد و ولد کردن (حشرات)

**بەچانە / baçane/**: ئاوەڵکار. منداڵانـە؛ زاوڵانـە ☰ بچه‌گانه

**بـەچاووڕاو / beçaw û řaw/**: ئاوەڵـناو. فێڵـباز؛ گزیکار ‹سەرزارەکی زۆر بـەچاووڕاوە/ خـاوێ‌دەمـە، کردەوەی گڵاوە «هەژار، *مەم و زین*»› ☰ نیرنگباز

**بەچقڵ / beç(i)qił/**: ئاوەڵـناو. دڕکاوی؛ دڕوواوی ☰ خاردار

**بەچک / beçik/**: نـاو. ١. بـەچک؛ تـەرح؛ بـیچم؛ کەسم؛ شکڵ؛ سەکوت ٢. بەچکـە؛ منـداڵ؛ زارۆ؛ زاورۆ؛ بێچـوو ٣. بـان مەڵاشـوو؛ بەشـە سـەری

هاوسای توێڵ ☰ ١. طرح؛ قیافـه ٢. بچـه ٣. چکـاد؛ بالای پیشانی

**بەچکە / beçke/**: ناو. وەچکـە: ١. بێچـوو؛ بـەچ؛ بەچکە؛ پسانک؛ گیانداری هێشتا پێنەگـەییو ٢. منداڵ ☰ ١. حیوان نابالغ ٢. کودک

**بەچکەئاسک / beçke'as(i)k/**: نـاو. کارخـەزاڵ؛ کارمامز؛ ئاسکۆڵە ☰ بچه آهو

**بەچکەبەراز / beçkeberaz/**: نـاو. بەچکـەوەراز؛ پەڵخ؛ کوودەڵە؛ پەڵخە ☰ بچەخوک

**بەچکەبەگ / beçkebeg/**: نـاو. پسـمیران؛ نەجیمزادە ☰ نجیبزاده

**بەچکە پشیلە / beçkep(i)şîle/**: نـاو. کـتبەچـە؛ کتوەچە ☰ بچەگربه

**بەچکەچێڵ / beçkeçêł/**: نـاو. حـۆلی؛ گۆلـک؛ گوێرەکە ☰ گوساله

**بەچکەحرچ / beçkeĥirç/**: ☜ بەچکەورچ

**بەچکەسەگ / beçkeseg/**: ناو. ١. بێچووی سـەگ؛ توولەسەگ ٢. *[مەجاز]* منداڵـی هـار و هـاج ☰ ١. تولەسگ ٢. بچەی بازیگوش

**بەچکەشا / beçkeşa/**: نـاو. شـازادە؛ شـازدە؛ شاوەرس ☰ شاهزاده

**بەچکەشێر / beçkeşêr/**: ناو. ١. بێچـووی شـیر ٢. *[مەجاز]* نەوەی ئازا و پاڵەوان ☰ ١. بچەشیر ٢. نسل دلیر

**بەچکەکەر / beçkeker/**: نـاو. جاشـک؛ جـاش؛ جەحش؛ هۆلیکەر ☰ کُرّەخر

**بەچکەمار / beçkemar/**: نـاو. توولـەمار؛ تیلـەمار؛ مارتوولە ☰ مار نوزاد؛ مار کوچک

**بەچکەورچ / beçkewirç/**: ناو. پاکۆڵ؛ بەچکەحرچ؛ حەشکۆلە ☰ تولەخرس

**بەچکەوەراز / beçkeweraz/**: ☜ بەچکەبەراز

**بەچگ / beçig/**: ☜ بەچك ـ١

**بەچنگ / beçing/**: ئاوەڵناو. ١. خاوەن چنجـرووک ٢. *[مەجاز]* خێرا و ئازا لـە دۆزینـەوەدا ☰ ١. دارای چنگال ٢. زرنگ در یافتن

**بەچوە / beçwe/**: ☜ بەچو

**بەچو / beçû/**: ناو. بەچکە؛ بەچوە؛ بێچوو ☰ بچه

**بەچوڵە / beçûłe/**: ناو. سـاوا؛ تـازەزاو؛ بێچـووی تازەهاتوو ☰ نوزاد

**بەچە / beçe/**: ناو. ١. بەچکـە؛ منـاڵ ٢. *[مەجاز]* بووک یان زاوا ٣. لووسکە ☰ ١. کودک ٢. عـروس یان داماد ٣. اَمرد

**بەچەباز / beçebaz/**: ئاوەڵناو. منالـباز؛ هـەتیوباز؛ کوڕگێ ☰ بچەباز

**بەچەبازی / beçebazî/**: ئاوەڵناو. منالـبازی؛ هەتیوبازی ☰ بچەبازی

**بەچەخۆرە / beçexore/**: نـاو. نەخۆشـی تێـر نەخواردن ☰ بیماری سیر نشدن

**بەچەدان / beçedan/**: ناو. پزدان؛ منالّدان؛ زێـدان ☰ زهدان؛ رَحِم

**بەچەسرکە / beçesirke/**: نـاو. ١. جۆرێ کـەرووی سەر خواردەمەنی ٢. مێشوولەیێ کە سرکە یـان میوەی کۆل و گەنیو هەڵـیدێنێ ☰ ١. قـارچ روی خوراک ٢. پشەی سرکه

**بەچەشنی / beçeşnî/**: ئـامراز. وەکـوو؛ وەکـی؛ وێنەی؛ چون؛ لەگوێن ‹لە پێش چاوم هەموو عالەم بەچەشنی پەڕڕەکاییکە/ سەرم گەرمە لە مەستیدا، چ دەربەستی کلاویکە؟! «قانع»› ☰ مانندِ

**بەچەک / beçek/**: ئاوەڵناو. چەکـدار؛ بـە ئـامرازی جەنگەوە ☰ مُسلح

**بەح / beĥ/**: دەنگ. پەکوو؛ تەح؛ وشەی سـەیرمان ☰ حرف تعجب

**بەحاستەم / beĥastem/**: ئاوەڵکار. بـە ئاسـتەم؛ بەحاڵ ‹بەحاستەم دەتوانم ببینم› ☰ به سختی

**بەحاسڵ / beĥasił/**: ئاوەڵناو. هـەزەخ؛ بـەرێژەو ☰ پردرآمد

**بەحاڵ** / beḧał/: ئاوەڵکار. ١. زۆر کەم؛ تۆزێک ‹ڕێیەکە/ هەر بەحاڵ پێت لە سەر بترازێ/ ئەزانی چیت لێ دێ؟! «شێرکۆ»› ٢. بە ئاستەم؛ بەحاستەم ‹عەزیز تەماشای براکەی کرد، بەحاڵ هەناسەی ئەهات «سوارە»› ☰ ١. خیلی کم ٢. بە سختی

**بەحاڵ و دوبەڵا** / beḧał û dûbeła/: ئاوەڵکار. بە ئاستەم؛ زۆر کەم ☰ خیلی کم

**بەحت** / beḧt/: ئاوەڵناو. گێژ؛ وڕ ☰ گیج؛ بهتزده

⊡ **بەحت بونەوە** ☜ **بەحتەو بون**

**بەحتەو بون**: بەحت بوونەوە؛ گێژ و وڕ بوون ‹ئەو خەوەرمە ژنەفت تاوێ بەحتەو بووم› ☰ مَنگ شدن؛ بهتزده شدن

**بەحر** / beḧir/: ناو. ١. زەریا؛ دەلیا؛ دەریا ٢. بەش؛ پار ☰ ١. دریا ٢. سهم و قسمت

**بەحریلکە** / beḧrîlke/: ناو. مراوی‌سپیلکە؛ مراوی سابوونی؛ جۆرێک مراوی بۆرە، خاڵخاڵی سپی پێوەیە ☰ اُردک مرمری

**بەحس** / beḧs/: ناو. باس ‹سەهم و نەسیبی ئەسلییە، بەحسی گیاه و گل نییە/ تووتنە خەرجی سووتنە، موودنە ماچی لەب دەکا «نالی»› ☰ موضوع

**بەحشینک**[1] / beḧşînk/: ناو. هەناری نەگەییو ☰ اَنار نارَس

**بەحشینک**[2]: ئاوەڵناو. [کنایە] بێ‌شەرم و حەیا ☰ بی‌حیا

**بەحوزم** / beḧuzm/: ئاوەڵناو. بەدەمار؛ بەغیرەت؛ مێرخاس ☰ باغیرت

**بەحەیا** / beḧeya/: ئاوەڵناو. شەرمن؛ شەرمین؛ فهێت‌کار ☰ محجوب؛ باحیا

**بەحیلە** / beḧîle/: ئاوەڵناو. وەگەڕ؛ فێڵباز ☰ مکار؛ حیلەگر

**بەخ**[1] / bex/: ناو. فیز فیس؛ دەعیە ☰ پُز

⊡ **بەخ کردن**: فیز نواندن؛ خۆ هەڵکێشان و تانەی خۆشی و بەختی خۆ لە دیتران دان ‹چییە ئەم هەموو تەنتەنە و من‌ـ‌منت؟/ ئەمەندە چییە فەخر و بەخ کردنت؟! «مەحوی»/ بەخ مەکە، بەخ ئەکەی! «مەسەل»› ☰ پُز دادن

**بەخ**[2]: دەنگ. پەخە؛ ئۆخەیش؛ ئایش؛ دەنگێک بە نیشانەی دەربڕینی دڵخۆشی ئاسوودە بوون ☰ آخش

**بەخت**[1] / bext/: ناو. وەخت: ١. تاڵە؛ هەدار؛ هات؛ باروودۆخی لەناکاو و چاوەڕواننەکراو لە ژیانی کەسێکدا ‹فەلەک وە بەختم چ نەردێ شانای/ نامەی حەیاتم وە هیچ نەوانای «مەولەوی»› ٢. پەیمان و بەقا ٣. پەنا؛ داڵدە ‹ئەز دێمە بەختێ تە› ٤. ☜ **بەخت کردن** ٥. ژیانی هاوسەری؛ شوو ‹چووە ماڵی بەخت› ☰ ١. بخت ٢. پیمان ٣. پناه ۴. ☜ **بەخت کردن** ۵. شوهر

▣ **بەختی بلند** ☜ **بەختی بەرز**

**بەختی بەرز**: [کنایە] بەختی بلند؛ بەختی تیژ؛ بەختەوەری؛ کامەرانی؛ بەختیاری ☰ بخت بلند/ بیدار

**بەختی تیژ** ☜ **بەختی بەرز**

**بەختی خەوتو**: [کنایە] بەختی ڕەش؛ بەختی کوێر؛ بەختی کەچ؛ بەختی نووستوو؛ بەختی خەواڵوو؛ کڵۆڵی؛ بەخت‌کوێری؛ ڕۆژڕەشی؛ چارەڕەشی ☰ بخت خفته

**بەختی ڕەش** ☜ **بەختی خەوتو**

**بەختی کوێر** ☜ **بەختی خەوتو**

**بەختی کەچ** ☜ **بەختی خەوتو**

**بەختی نوستو** ☜ **بەختی خەوتو**

⊡ **بەخت بە دەمەوە هاتن**: [کنایە] باش هێنان؛ شانس هاوردن ☰ بخت یاری کردن

**بەخت بەسیان**: [کنایە] بەخت چوونە بەس؛ گیر و گرفت لانەچوون (بە تایبەت بۆ ژن خواستن و شوو کردن) ☰ طلسم شدن

**بەخت تاقی کردنەوە** تاڵە گرتنەوە طالع گرفتن

**بەخت چونە بەس** ☜ بەخت بەسیان

**بەخت ڕو تێکردن** /کینایە/ هەل بۆ کەسێک ڕەخسان بخت به در خانەی کسی را زدن

**بەخت کرانەوە** /کینایە/ بەختی کەسێک بەر بوون، بەتایبەت بۆ ژن خواستن و شوو کردن طلسم شکستن

**بەخت کردن** ١. خەرج کردن ٢. فیدا کردن ‹بۆت بەخت دەکەم عومری درێژم/ سەد تاڵ و سوێریت لەسەر دەچێژم «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ١. خرج کردن ٢. فدا کردن

**بەخت نەهێنان** /کینایە/ خراپ هێنان؛ شانس نەهاوردن ‹وەک مریشکێ کە بەختی نەیهێنێ/ بێت و جووچکەی مراوی هەڵبێنێ! «حاجی قادر»› بدشانسی آوردن

**بەخت وەرگەڕان** /کینایە/ تووشی نەهاتی و بەدبەختی بوون بخت برگشتن

**بەخت یار بون** /کینایە/ شانس هێنان ‹وتیان بدە موژدە، بەختە یارت/ پێک‌هاتووە، ڕێکە کاروبارت «هەژار، *مەم و زین*»› بخت یار بودن

**بەختی کەسێک بەربون** /کینایە/ بەختی کەسێ کرانەوە، بەتایبەت بۆ ژن خواستن و شوو کردن بخت کسی باز شدن

**بەختی کەسێک کوێرەو کردن** /کینایە/ بە گازە و جادوو، کۆست بەستن بۆ بەرگری لە شوو کردنی کەسێک بخت کسی را بستن

**چونە ماڵی بەخت** /کینایە/ شوو کردن بە خانەی بخت رفتن

**لەقە لە بەختی خۆ دان** /کینایە/ هەل بە دەرفەت نەزانین؛ دەرفەتی ڕەخساو لەکیس دان بە بخت خود پشت‌پا زدن

ـ **بەخت**[٢]: پاشەوشە. ـــ تاڵە؛ ـ شانس؛ هات؛ ‹ئەگەرچی من گەدام ئەو شا، لە عورفی عیشقدا مەحوی!/ بەسە نیسبەت لە بەینا، من سیابەخت، ئەو سیاچەردە «مەحوی»› ـ بخت

**بەختان** / bextan/: ناو. ١. دۆخی بەخت هێنان؛ لە سەر شانس بوون ٢. دۆخی خراپ هێنان؛ لەسەر شانس نەبوون ١. خوش‌شانسی ٢. بدشانسی

◘ **بەختان بون** /پلار/ لە نەهاتی بوون؛ تووشی نەهاتی بوون ‹بەختانمانە! هەر ئەوەمان ماگە بنیشینە هەڕگ› بدشانسی آوردن

**بەختبەسراو** / bextbesraw/: ئاوەڵناو. بەختنووستوو؛ تایبەتمەندی کچێ کە داواکاری نەبێت بخت‌بسته

**بەختدار** / bextdar/: ئاوەڵناو. بەختەوەر؛ بە ئیقباڵ؛ بە سعوود خوشبخت

**بەخترەش** / bextřeş/: ئاوەڵناو. چارەڕەش؛ بەدبەخت و نەگبەت سیه‌بخت

**بەختزان** / bextzan/: ناو. /کۆن/ ئەستێرەگەر طالع‌بین

**بەختزانی** / bextzanî/: ناو. /کۆن/ ئەستێرەگەری طالع‌بینی

**بەختکراو** / bextk(i)raw/: ئاوەڵناو. تێچوو؛ خەرج‌کراو هزینه‌شده

**بەختکوێری** / bextk(i)wêrî/: ناو. بێ‌بەختی؛ بەدبەختی کوربختی

**بەختکەنۆک** / bextkenok/: ئاوەڵناو. بەختەوەر خوشبخت

**بەختنوستو** / bextnûstû/: ئاوەڵناو. ١. ☜ بەختبەسراو ٢. بەدبەخت و بەدئیقباڵ ١. ☜ بەختبەسراو ٢. بخت‌برگشته

**بەختوبنە** / bext û bine/: ناو. بەخت و ناو/ نێوچاو؛ شانس و ئیقباڵ ‹بەختوبنەت ڕەش نەبێ کچم!› شانس

**بەختوناو/ نێوچاو** / bext û naw/ nêwçaw/: ☜ بەختوبنە

**بەختە**[1] / bexte/: ناو. بەران؛ نێری ⌂ قوچ

**بەختە**[2]: ئاوەڵناو. پەرواری؛ دابەستە؛ بەنی؛ دەرماڵە؛ دەرماڵی؛ بەسلەمە؛ لەبار بۆ دابەستن ⌂ پرواری

**بەختەباران** / bextebaran/: ناو. بەختەڵباران؛ بەختەواران؛ بارانەی گولەدەغڵ قەڵەو کردن کە تایبەت بە مانگی جۆزەردانە و لە هات و نەهاتدایە ‹بزەی دەرمانی دەردی دەردەداران/ وشەی وەک بەختەبارانی هەژاران «هێمن»› ⌂ باران خردادی

**بەختەبەران** / bexteberan/: ناو. بەرخە نێری دوو ساڵە کە هەڵیدەگرن بۆ داشت تا ببێتە بەران ⌂ برّەی دو ساله که برای قوچ شدن نگه می‌دارند

**بەختەشار** / bexteşar/: ناو. ئۆتۆپیا ⌂ اوتوپیا

**بەختەک** / bextek/: ناو. مۆتەکە؛ کابووس؛ دۆخی سنگ سوار بوون لە خەودا بە هۆی تەزینی لەشەوە ⌂ بختک

**بەختەکی** / bextekî/: ئاوەڵکار. بە هەڵکەوت؛ خۆوبەختی ⌂ تصادفی؛ اتفاقی

**بەختەڵباران** / bextełbaran/: ☜ بەختەباران

**بەختەمام** / bextemam/: ئاوەڵناو. ڕاست و قسەپتەو ⌂ رُک و راست

**بەختەمامی** / bextemamî/: ناو. ڕاستی و قسەپتەوی ⌂ رُک و راستی

**بەختەوار** / bextewar/: ئاوەڵناو. بە ویژدان و ڕاست ⌂ باوجدان و درستکار

**بەختەواران** / bextewaran/: ☜ بەختەباران

**بەختەوەر** / bextewer/: ئاوەڵناو. بەختیار؛ بەختدار؛ خۆشبەخت؛ وەشبەخت؛ تێوڵدار؛ خاوەن بەختیاری؛ بە بەخت؛ قێوڵدار ‹گیان دەستی لە ئاووگڵ کە بەر بوو/ بە نیازی گەییشت و بەختەوەر بوو «هەژار، مەم و زین»› ⌂ خوشبخت

**بەختەوەری** / bextewerî/: ☜ بەختی بەرز

**بەختیار** / bext(i)yar/: ئاوەڵناو. بەختەوەر ⌂ بختیار

**بەختیاری** / bext(i)yarî/: ناو. بەختەوەری؛ کامڕەوایی؛ خاوەن بەختی ‹لالووتە لە ئێمە چەرخی گەردوون/ پێی حەیفە بژین بە بەختیاری! «مەلا غەفوور»› ⌂ خوشبختی

**بەخزمەت** / bexizmet/: ئاوەڵناو. ١. قەدرگری میوان ٢. ژێردەستی ئازا و گوێلەمست ⌂ ١. مهمان‌دوست ٢. گوش‌بەفرمان

**بەخش**[1] / bexş/: ناو. ١. بەش؛ پاژ؛ پارچە ٢. بەشێکی دیاریکراوی سەر بە شارێ ⌂ ١. قسمت ٢. بخش؛ ناحیه

▪ **بەخش**[2]: پاشەوشە. ١. فیداکەر ‹خۆبەخش› ٢. پێدەر ‹ئەمە بۆی نەسیمی بەهارە؟ یا خەبەری سرووشی هەواییە؟/ دەمی ڕۆحبەخشی نیگارە؟ یا نەفەسی مەسیحی سەماییە؟ «بێخود»› ⌂ ١و٢. ـ بخش

**بەخشان** / bexşan/: ☜ بەخشین

**بەخشاندن** / bexşandin/: چاوگ. ١. بەخشین ٢. لێبووردن ٣. بەش کردن ⌂ ١. عطا کردن ٢. بخشیدن ٣. تقسیم کردن

**بەخشایشت** / bexşayişt/: ناو. عافوو؛ کار و ڕەوتی بووردن لە تاوان ⌂ بخشایش

**بەخشران** / bexşran/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //بەخشرای؛ دەبەخشرێی؛ ببەخشرێ// بەخشیان؛ وە بەر بەخشش کەوتن ⌂ بخشیده/ بخشوده شدن ■ ئاوەڵناوی بەرکاری: بەخشراو/ چاوگی نەرێنی: نەبەخشران

**بەخشراو** / bexşraw/: ئاوەڵناو. بووراو؛ خەلاتی؛ نوخافتی ⌂ بخشیده شده

**بەخشش** / bexşiş/: ناو. خەلات؛ کاری بە خۆشی و خۆڕایی خەلات یان دراو دان ⌂ انعام

**بەخشندە** / bexşinde/: ئاوەڵناو. دلاوا؛ دەهندە؛

سەخی؛ بەدڵ 🇮🇷 بخشنده

**بەخشندەیی** / bexşindeyî/: نـاو. نـان‌بـدەیی؛ سەخاوەت؛ دلاوایی 🇮🇷 بخشندگی؛ سخاوتمندی

**بەخشیان** / bexşyan/: ☜ **بەخشران**

**بەخشین** / bexşin/: چـاوگ. تێنەپـەڕ. //بەخشـیت؛ دەبەخشـی؛ ببەخشـە// بەخشـان: ١. دانی بـێ قەرەبوو ٢. عافوو کردن؛ لێبـووردن ‹واتـش ئـەی سـەیباد تـۆ عەشـقی پـیرت/ ببەخشـە پێمـان ئـارۆ نەچیرت «سەیدی»› 🇮🇷 ١. کمک کردن بلاعوض ٢. عفو کردن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: بەخشـیو/ چـاوگی نـەرێنی: نەبەخشین

**بەخشـینەوە** / bexşînewe/: چـاوگ. تێـپەڕ. //بەخشـیتەوە؛ دەبەخشـیەوە؛ ببەخشـەوە// ١. بەخشین ٢. دابەش کردن؛ بـەش‌کردنـەوە 🇮🇷 ١. بخشیدن ٢. توزیع کردن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: ـــ/ چـاوگی نـەرێنی: نەبەخشینەوە

**بەخورتی** / bexurtî/: ئاوەڵناو. ئیجباری 🇮🇷 اجباری

**بەخوری** / bexurî/: ئاوەڵـناو. تیسـکن؛ تـووکن 🇮🇷 پشمالو

**بەخوڕ** / bexuř/: ئاوەڵـناو. بـەخوڕ‌ڕەم؛ تونـد و بێ‌پسانەوە ‹لە چاوم دێ بەخوڕ فرمێسکی خوێنین/ کەچی ئەم گۆمە خوێنـە هەڵـنەچۆڕا! «هـێمن»› 🇮🇷 تند و شدید

**بەخوڕڕەم** / bexuřřem/: ئاوەڵـناو. ١. بەخوڕ؛ توند و بێ‌پسانەوە ‹بارانی بەخوڕڕەم› ٢. بەتەوژم ‹لافـاوی بەخوڕڕەم› 🇮🇷 ١. تند و شدید ٢. پُرفشار

**بەخۆدادەر** / bexodader/: ناو. سەرەخەر؛ سەرنا 🇮🇷 رختخواب

**بەخۆڕایی** / bexořayî/: ئاوەڵـناو. هەوانتە؛ بێ‌فایـدە 🇮🇷 بیهوده

**بەخۆژیو** / bexojîw/: ئاوەڵـناو. خـۆژی 🇮🇷 متکـی بەخود

**بەخۆوە** / bexowe/: ئاوەڵـناو. کەڵـەگەت؛ بلەرمـە؛ ئەستوور و تێک‌سمڕاو 🇮🇷 تنومند

**بەخەبەر** / bexeber/: ئاوەڵـناو. ١. نەخـەوتوو؛ بـە ئاگـا ٢. ئاگـا؛ ئاگـادار ‹لـەو لاشـەوە شـاعیرێکی خەولێ‌کەوتوو/ بەلام شیعرێکی بەخەبەر! «شـێرکۆ»› 🇮🇷 ١. بیدار ٢. خبیر

**بەخەڵ** / bexel/: ناو. ١. باخـەڵ ٢. گیرفـان 🇮🇷 ١. بغل ٢. جیب

**بەخـەڵفرۆش** / bexelfiroş/: نـاو. دەسـفرۆش؛ چەرچی ناو بازار 🇮🇷 دستفروش

**بەخی** / bexî/: ئاوەڵناو. شلوێ؛ لێل 🇮🇷 گل‌آلود

**بەخیرەت** / bexîret/: ئاوەڵـناو. ١. بوێر؛ ئازا؛ نەترس ٢. خاوەن نامووس 🇮🇷 ١. شجاع ٢. غیرتمند

**بەخیل** / bexîl/: ئاوەڵناو. بەغیل؛ بـەخێل؛ بـەغێل: ١. ڕژد؛ چـرووک؛ ڕەزیـل؛ دەس‌قووچـاو ٢. بەئێرەیی؛ حەسوود 🇮🇷 ١. خسیس ٢. حسود

**بەخیلی** / bexîlî/: ناو. بەغیلی؛ بەغێلـی؛ بەخێلـی؛ ئێرەیی؛ هاڤێژی؛ ئێرەیی 🇮🇷 حسادت

**بەخیە** / bexye/: ☜ **بەقیە**

**بەخێر** / bexêr/: ئاوەڵـناو. بـەهرەوەر؛ بـەقازانج 🇮🇷 بابرکت

⊡ **بەخێر هـاتن**: خۆش هـاتن ‹یـاخوا بـەخێر بـێن چاوگـەلمان ڕۆشـن/ هـەردووکیان بۆمـان زۆر تێدەکۆشن «پیرەمێرد»› 🇮🇷 خوش آمدن

**بەخێر هێنان**: پێشوازی کردن 🇮🇷 استقبال کردن

**بەخێروبێر** / bexêr û bêr/: ئاوەڵناو. پڕپیت؛ پـیرۆز ‹ئەوە سەدایە، ئەوێ پیرەپایزێ لە سـەری داوم. وەی کوڕینە! چەندە پایزێکی بـەخێروبێر و خـۆش پـایزە! «بەیتی کوردی»› 🇮🇷 پُرخیر و برکت

**بەخێرهاتن‌کـەر** / bexêrhatinker/: نـاو. ئـەوەی کاری بە پیری میوانەوە چوون و وتـنی بـە خێـر هاتنە پێیان ‹کۆڕی بەر باغچەی مەکتەب گەرم بوو/

بەخێرهاتن‌کەر ئەهات و ئەچوو «گۆران»› 🇮🇷 استقبال کننده

**بەخێڵ / bexêł/:** ☜ بەخیل

**بەخێڵی / bexêłî/:** ☜ بەخیلی

**بەخێو[1] / bexêw/:** ناو. ئاگاداری؛ سەرپەرشتی؛ ئیووەت؛ ڕەوتی حاواندنەوە؛ حەواندنەوە 🇮🇷 سرپرستی

⊡ **بەخێو کردن:** بەخۆ کردن؛ پەروەردە کردن ‹بەخێوم کردی ڕۆلە وەک بەران/ تا بۆ نیشتمان بتکەمە قوربان «هێمن»› 🇮🇷 سرپرستی کردن؛ پروردن

**بەخێو[2]:** ئاوەڵناو. خاوەندار 🇮🇷 دارای صاحب

**بەخێوکار / bexêwkar/:** ☜ بەخێوکەر

**بەخێوکراو / bexêwk(i)raw/:** ئاوەڵناو. پەروەردە 🇮🇷 پرورده

**بەخێوکەر / bexêwker/:** ناو. بەخێوکار؛ سەرپەرشت ‹زەمانە هیچ بەخێوکەر بوو بە عومری/ فەلەک هەر دوون‌پەرەست و سپلەپەروەر «قانع»› 🇮🇷 سرپرست

**بەد[1] / bed/:** ئاوەڵناو. ١. خراپ؛ خراو ‹کاریکی بەدت کردا› ٢. هار و لاسار ‹هەتیویکی بەدە، قسەی بە گوێدا ناچێ!› ٣. شووم؛ نەحس ‹پێوقەدەمێکی بەدی هەیە!› 🇮🇷 ١. بد ٢. سرسخت ٣. شوُم

**بەد ـ[2]:** پێشوشە. بەو؛ بەی ـ؛ خاوەن چۆنایەتییەکی دڵنەخواز ‹بەدبەخت؛ بەدفەڕ؛ بەدئەمەگ› 🇮🇷 بد ـ

**بەدئاکار / bed'akar/:** ئاوەڵناو. خراپکار 🇮🇷 بدرفتار

**بەدئۆغر / bed'oğ(i)r/:** ئاوەڵناو. بەدیومن؛ بەدفەڕ 🇮🇷 شوُم

**بەدئەتوار / bed'etwar/:** ئاوەڵناو. بەدتەور؛ بەدڕەوشت ‹سەرسەری و ئەوباش و بەدئەتواری وەک تۆ چۆن ئەبێ/ ببیە پیاویکی زەریف و شوهرەت و نامت ببێ؟ «ئەحمەد موختار جاف»› 🇮🇷 بدرفتار

**بەدئەخلاق / bed'exlaq/:** ئاوەڵناو. بەدخوو؛ بەدکردار 🇮🇷 بداخلاق

**بەدئەدا / bed'eda/:** ئاوەڵناو. جلف؛ سووک و چرووک؛ ئاکار ناپەسەند 🇮🇷 هرزه

**بەدئەسڵ / bed'esł/:** ئاوەڵناو. تنتیک؛ بەدنیژاد 🇮🇷 بداصل

**بەداخ / bedax/:** ئاوەڵناو. خەمگین؛ دڵ‌بەخەم 🇮🇷 داغدار

**بەداخەوە / bedaxewe/:** ئاوەڵکار. حەیفێ؛ حەیفی؛ حەیف؛ مخابن؛ حەیف و خەساری 🇮🇷 متأسفانه

**بەدانستە[1] / bedaniste/:** ئاوەڵناو. لە ڕووی زانستەوە ‹لێدوانێک بەدانستە دەربارەی کورد و کوردستان› 🇮🇷 عالمانه

**بەدانستە[2]:** ئاوەڵکار. بەتایبەت ‹گەردوون کە بەدانستە دەیانکا، وەک شێت/ تێکیان هەڵەشێلێت و دەیانکاتەوە قوڕ «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› 🇮🇷 مخصوصاً

**بەدایی / bedayî/:** ناو. ناڵەی ناخۆش؛ کرووزانەوەی نەساخ 🇮🇷 آه و نالهٔ بیمار

**بەدبار / bedbar/:** ئاوەڵناو. نابار؛ ناشیرین؛ نەپۆڕ 🇮🇷 بدریخت

**بەدبسێن / bedbisên/:** ئاوەڵناو. زۆر ڕژد و سوور لە سەر سەندنەوەی قەرز 🇮🇷 پیگیر در پس گرفتن قرض

**بەدبۆ / bedbo/:** ئاوەڵناو. بۆگەن 🇮🇷 بدبو

**بەدبەخت / bedbext/:** ئاوەڵناو. کڵۆڵ؛ کرۆل؛ بەوبەخت؛ بەیبەخت؛ قەرەبەخت؛ چارەڕەش؛ ناوچاوان‌ڕەش؛ گەرجە؛ تەڵگی‌وبەڵگی؛ بەرگەشتە؛ داماو؛ داماگ؛ دیز؛ کتۆر؛ ڕۆژڕەش؛ بەدرەژەن؛ سییەبەخت؛ قەشقە؛ بۆنەهاتوو؛ بۆنەهاتگ؛ بارکەوتوو؛ هەرگ‌بەسەر؛ خەرگەسەر؛ نامەی؛ هەری‌وەسەر 🇮🇷 بدبخت

**بەدبەختانە** / bedbextane/: ئاوەڵکار. بەداخـەوە؛ لە بەختی خراپەوە ⯀ بدبختانه

**بەدبەختی** / bedbextî/: نـاو. بەرگەشـتی؛ ڕۆژڕەشـی؛ قوڕبەسـەری؛ مـووروز؛ نەگبـەتی؛ نەهاتی ⯀ بدبختی

**بەدبەدە** / bedbede/: ناو. هەوێردە ⯀ بلدرچین

**بەدبین** / bedbîn/: ئاوەڵناو. ڕەشبین؛ چاوتاریـک؛ خـاوەن لێکدانـەوە و هەڵسـەنگاندنی خـراپ و داوەری چەوت بەرانبەر بە دیتـران و ڕووداوان ⯀ بدبین

**بەدبێژ** / bedbêj/: ☜ **بەدزوان**

**بەدپەسەن** / bedpesen/: ئاوەڵناو. دژپەسـەن ⯀ بدسلیقه

**بەدتوخم** / bedtuxm/: ئاوەڵناو. ١. ناڕەسـەن ٢. نێرەی گیانداری کە بەچکـە یـان منالـی باشـی لێنەکەوێتەوە ⯀ ١. نانجیب ٢. بدتخم

**بەدتەور** / bedtewr/: ئاوەڵناو. ئەتواری؛ ئاکارخراپ ‹لـە مـن نـازانم ئیتـر نەفسـی بـەدخوو چـی دەوێ مـەحوی؟/ کـە بـەدکردارو بـەدڕەفتار و بەدئـەفکار و بەدتەورم «مەحوی»› ⯀ بدروش

**بەدجنس** / bedcins/: ئاوەڵناو. بەدفەڕ؛ جەڵـەب ⯀ بدجنس

**بەدجنسی** / bedcinsî/: ناو. جەڵەبی؛ خراوەکێلـی ⯀ بدجنسی

**بەدچارە** / bedçare/: ئاوەڵناو. خوێنتـاڵ؛ بـەدزەڕە؛ بەدسەکوت؛ بەدشکڵ؛ ئێسکقورس ⯀ بدترکیب

**بەدحاڵ** / bedĥał/: ئاوەڵناو. ١. بـەدژیوار ٢. حاڵنەدار؛ نەخۆش ⯀ ١. بینوا ٢. بدحال

**بەدخوا** / bedx(i)wa/: ☜ **بەدخواز**

**بەدخواز** / bedx(i)waz/: ئاوەڵناو. بـەدخوا؛ بـەدواز؛ دڵپیس؛ لە چاکـە دوور ‹فێڵـباز و بـەراز و ڕق لـە سینە/ بەدخواز و نەساز و دڵبەکینە «هـەژار، مـەم و زین»› ⯀ بدخواه

**بەدخوو** / bedxû/: ئاوەڵناو. نـەگونجاو؛ بـێئاکـار ‹قەسدی یاریتە لە کـن بـەزمی ڕەقیـب/ یـاری مـن خۆت مەکە بەدخوو بە عەبەس «نالی»› ⯀ بدخو

**بەددڵ** / beddił/: ئاوەڵناو. دڵپـیس؛ بیرخـراپ. هەروەها: **بەددڵی** ⯀ بددل

**بەددیمەن** / beddîmen/: ئاوەڵناو. ناشیرین؛ ناحـەز ⯀ بدمَنظر

**بەدر** / bedr/: ناو. مانگ چواردە؛ هەلاب؛ مانگی پڕ ⯀ بدر؛ ماه تمام

**بەدروستی** / bed(i)rustî/: ☜ **بەڕاس ـ٢**

**بەدرەقە** / bedreqe/: نـاو. ڕەوانـە؛ کـاری بـەڕێ کردن ⯀ بدرقه

**بەدرەمە** / bedreme/: نـاو. شـەمەترێلکە؛ زینـدەوەرێکی درێژووکـەی ڕەشـی بـاریکتر لـە هەنگ، شانە بە دڕکانەوە هەڵدەبەستێ ⯀ نوعی زنبور سیاه

**بەدڕا** / bedřa/: ئاوەڵناو. ١. بیرخـراپ؛ دڵپـیس؛ هزرپیس ٢. خاوەن بـیر و بـاوەڕی خـراپ ⯀ ١. بدنهاد ٢. مُنحرف

**بەدڕست** / bedřist/: ئاوەڵناو. بە تایبەتمەندی ڕست نەدانەوە (بۆ تانجی) ⯀ تازی بدقلق

**بەدڕەژەن** / bedřejen/: ئاوەڵناو. کلـۆڵ؛ کـرۆڵ ⯀ بدبخت

**بەدڕەسەن** / bedřesen/: ئاوەڵناو. ناڕەسـەن؛ نانەجیب ⯀ نانجیب؛ بداصل

**بەدڕەفتار** / bedřeftar/: ئاوەڵناو. بـەدئاکار؛ بەدکردار؛ قیچمەز؛ قیچمەس؛ لاسار ⯀ بدرفتار

**بەدڕەنگ** / bedřeng/: ئاوەڵناو. ڤرتۆنی؛ گەنـەڕەنگ ⯀ بدرنگ

**بەدڕەوش** / bedřewiş/: ئاوەڵناو. ئەتوارلـەق؛ ئاکارناحەز ⯀ بدرفتار

**بەدزوان** / bedz(i)wan/: ئاوەڵناو. زمـانپـیس؛ دەمپیس؛ بەدبێژ؛ جنێوفرۆش ⯀ بددهن

**بەدزەڕە / bedzeře/:** ☜ **بەدچارە**

**بەدزییەوە / bedizîyewe/:** ئاوەڵکار. دزەکی؛ بێدزی؛ بە نهێنی ‹هاتە ناو شار بەدزییەوە/ زەرنگەرێکی دۆزییەوە «پیرەمێرد»› 🇮🇷 دُزدکی؛ یواشکی

**بەدژیوار / bedjîwar/:** ☜ **بەدحاڵ**

**بەدسەکوت / bedsekut/:** ☜ **بەدچارە**

**بەدشکڵ / bedşik(i)ł/:** ☜ **بەدچارە**

**بەدعەمەڵ / bed'emeł/:** ☜ **بەدعەمەڵ**

**بەدعەمەڵ / bed'emeł/:** ئاوەڵناو. بەدعەمەل؛ ئاکارخراپ 🇮🇷 بدکار

**بەدفەڕ / bedfeř/:** ئاوەڵناو. ١. بەدجنس؛ نارەسەن؛ خاوەن بیر و هزری خراپ ‹پێش ئەوەی گزیری بەدفەڕ/ لە دیوەخان پاروو با دا «هێمن»› ٢. بەدودم؛ بەدورم؛ بێفەڕ؛ شووم؛ کوچکڕەش؛ جووتقۆشە؛ قۆشقە؛ قۆشە؛ قۆشمە؛ نالەبار و کۆڵەزەرەر ‹لە بەر تۆ چارەنووسی شوومی بەدفەڕ!/ ئەوی قەت لێی نەدەم، تەپڵی ئەمانە «هێمن»› ❋ هەروەها: **بەدفەڕی** 🇮🇷 ١. بدجنس ٢. شوُم

**بەدفەساڵ / bedfesał/:** ئاوەڵناو. ناشیرین؛ ناحەز؛ خوێنتاڵ 🇮🇷 بدشکل

**بەدقەدەم / bedqedem/:** ئاوەڵناو. [مەجاز] پاوشک؛ پێڕەش 🇮🇷 بدقدم

**بەدقەوارە / bedqeware/:** ئاوەڵناو. بەدچارە؛ ناقۆلا 🇮🇷 بدقوارە

**بەدقەول / bedqewl/:** ئاوەڵناو. بەدقەول؛ پەیمانشکێن. هەروەها: **بەدقەولی** 🇮🇷 بدقول

**بەدقەوڵ / bedqewł/:** ☜ **بەدقەول**

**بەدکار / bedkar/:** ئاوەڵناو. ١. گەنەکار ٢. شووفار؛ تێچێن؛ شەیتانیکەر 🇮🇷 ١. بدکار ٢. خبرچین

**بەدکارە / bedkare/:** ئاوەڵناو. پەست 🇮🇷 فرومایە

**بەدکاری / bedkarî/:** ناو. خراپی؛ بەدفەڕی 🇮🇷 بدی

**بەدکردار / bedkirdar/:** ئاوەڵناو. بەدئاکار 🇮🇷 بدکردار

**بەدگڵ / bedgil/:** ئاوەڵناو. دزێو؛ ناحەز 🇮🇷 زشت؛ بدگل

**بەدگۆ / bedgo/:** ئاوەڵناو. بەدزوان؛ بەدواچ 🇮🇷 بدگو

**بەدگوز / bedgûz/:** ئاوەڵناو. ڕکلەزک و ناحاڵی 🇮🇷 کینەتوز

**بەدلغاو / bedl(i)ğaw/:** ئاوەڵناو. لغاوقەبوولنەکەر؛ تایبەتمەندی ئەسپ و ماینی سەرڕەق 🇮🇷 بدلگام

**بەدڵ[1] / bedił/:** ئاوەڵناو. ١. دڵاوا؛ بەخشندە ٢. ئازا؛ دلێر ٣. ڕاستەقینە؛ ڕاستەکی ‹کاری بەدڵ› ٤. پەسند ‹ئەم کراسەم بەدڵە› 🇮🇷 ١. بخشندە ٢. شجاع ٣. حقیقی ٤. پسند

⊡ **بەدڵ بوون:** پەسند کردن 🇮🇷 پسندیدن

**بەدڵ[2]:** ئاوەڵکار. بەڕاست؛ لە ناخی دڵەوە ‹ڕەفیقان ڕۆژی کوردانە بەهارە جێژنی نەورۆزە/ بەدڵ لێتان دەکەم لەو ڕۆژەدا من جێژنە پیرۆزە «هێمن»› 🇮🇷 از تە دل

⊡ **بە دڵ (کەسێ) کردن:** بەرامبەر بە ئارەزووی (کەسێ) جووڵانەوە 🇮🇷 مطابق میل (کسی) عمل کردن

**بە دڵەوە چەسپان:** بەدڵەوە چەسپین؛ بەدڵەوە نووسان؛ پەسند کردن 🇮🇷 پسندیدن

**بەدڵوداو / bedił û daw/:** ئاوەڵکار. لە کانگای دڵەوە؛ بە داوخوازێکی لە ناخی دڵەوە 🇮🇷 از تە دل

**بەدڵوداوێن / be dił û dawên/:** ئاوەڵکار. بەدڵ و دایەن؛ بەدڵوگیان؛ لە کانگای دڵەوە و بەتایبەتی ‹ئەم کراسەم بەدڵ و داوێن بۆ تۆ کڕیوە› 🇮🇷 از دل و جان

**بەدڵودایەن / be dił û dayen/:** ☜ **بەدڵ و داوێن**

**بەدڵوگیان / be dił û g(i)yan/:** ☜ **بەدڵ و داوێن**

**بەدماژە / bedmaje/:** ئاوەڵناو. مڕ و مۆن؛ ناوچاو تورشیاگ 🇮🇷 بدأخم

**بەدمەجاز / bedmecaz/**: ئاوەڵناو. نەبان؛ نەوان؛ هەمیشه قەلس و تووڕە ☰ بدخُلق؛ عصبانی

**بەدمەست / bedmest/**: ئاوەڵناو. ڕەشەمەست؛ مەستی کەلەلا؛ زۆر سەرخۆش ☰ بدمست

**بەدمەستی / bedmestî/**: ناو. شەڕ و هەرای مەستانە ‹شوکور هوشیارە مەحوی تێدەگا دنیا خەراباتە/ کە بەدمەستی بکا ئەهلی، خراپەی بۆچی لێ دەگرم «مەحوی»› ☰ بدمستی

**بەدمینتون / bedmîntun/**: ناو. وەرزشێکی دوو یان چوار کەسی بە ڕاکێتی دەسکەدرێژ و تۆپی چکۆلەی وەک زەمبیلەوە ☰ بدمینتون

**بەدنام / bednam/**: ☜ بەدناو

**بەدناو / bednaw/**: ئاوەڵناو. بەدنێو؛ بەدنام؛ ناوزڕاو؛ ناوزڕیاگ؛ ناڤنۆ؛ نامڤەت؛ بەناو و ناوبانگی خراپەوە. هەروەها: **بەدناوی** ☰ بدنام

**بەدنمەک / bedn(i)mek/**: ئاوەڵناو. بێوەفا؛ سپڵە؛ پێنەزان ☰ نمک‌نشناس

**بەدنیژاد / bednîjad/**: ☜ بەدنەسڵ

**بەدنیهاد / bednîhad/**: ئاوەڵناو. دڵخراپ؛ دڵپیس؛ بەدخوا ☰ بدنهاد

**بەدنێو / bednêw/**: ☜ بەدناو

**بەدواچ / bedwaç/**: ئاوەڵناو. زمانپیس ☰ بدزبان

**بەدواز[1] / bedwaz/**: ناو. هومال؛ هاڤرک ‹تۆ بە دەستی وێت جە بەدوازەکەم/ منت بێناز کەرد ساحێب نازەکەم! «سەیدی»› ☰ رقیب

**بەدواز[2]**: ئاوەڵناو. بەدخواز؛ خراپەویست؛ خوازیاری خراپەی خەڵکی ☰ بدخواه

**بەدودم / bedwidm/**: ئاوەڵناو. قۆشە؛ شووم؛ بەدوم ☰ نحس؛ شوم

**بەدودمی / bedwidmî/**: ناو. قدۆشی؛ شوومی ☰ شومی؛ نحسی

**بەدورم / bedwirm/**: ☜ بەدفەڕ[2]

**بەدوم / bedum/**: ☜ بەدودم

**بەدوێژ / bedwêj/**: ئاوەڵناو. زمانپیس ☰ بدزبان

**بەدور / bedûr/**: ☜ بەری[2]

**بەدەر[1] / beder/**: ئاوەڵناو. جیا؛ جیاواز؛ لە دەرەوەی شوێن یان کۆمەڵێک ‹ئەمبەر ـ ئەوبەرە، خەڵکی کام بەڕی؟/ ئەوەندە جوانی لە عام بەدەری «فولکلۆر»› ☰ استثنا

**بەدەر[2]**: ئامراز. وەدەر؛ جگە؛ بێجگە ‹دڵەکەم دەربێنن بە نووکی خەنجەر/ هیچی تیا نییە، لە زووخاو بەدەر «فولکلۆر»› ☰ جز

⊡ **بەدەر بوون**: وەدەرکەوتن؛ چوونە دەرەوە ‹ساقی دەخیلە! بمدەرێ جامێ/ با لە عالەمی مادە بەدەر بم «بێکەس»› ☰ بیرون شدن

ـ **بەدەر[3]**: پاشەوشە. بۆ دەرەوە ‹شاربەدەر؛ بێگانەبەدەر› ☰ بیرون

**بەدەرەتان / be deretan/**: ئاوەڵناو. بەرواز ☰ وسیع

**بەدەرەک / be derek/**: سارستە. بەتوون؛ چش ☰ به درک

**بەدەری / be derî/**: ناو. دوورەپەرێزی ☰ اِنزوا

**بەدەس[1] / bedes/**: ئاوەڵناو. [مەجاز] بەدەست: ١. بە دەسەلات؛ دەسڕۆیشتوو ٢. چابک و کارامە ☰ ١. بانفوذ ٢. چابک و کارا

**بەدەس[2]**: ئامراز. بەدەست؛ لەدەس؛ لەدەستی ‹شەها! بە غیرەتت قەسەم دەمێکە دیلە ئوممەتت/ بەدەس عەدوویی دینەوە عەجەب زەلیلە ئوممەتت «بێخود»› ☰ از دستِ

ـ **بەدەس[3]**: پاشەوشە. [مەجاز] ـ بەدەست ‹لەوێش میرێکی زاڵم کاربەدەس بوو/ لەوێش بێچاوڕوویێ داربەدەس بوو «هێمن»› ☰ ـ بدست

**بەدەست / bedest/**: ☜ بەدەس

**بەدەستوبرد[1] / be dest û bird/**: ئاوەڵناو. خێرا؛ فرز؛ دەسسڤک ☰ فِرز

**بەدەستوبرد[2]**: ئاوەڵکار. خێرا؛ ئازا؛ کرژ ☰ سریع

**بەدەستەواو[1] / bedestewaw/**: ناو. بەدێلفانی؛

ڕەوتی یارمەتی یەکتر دان ☰ همیاری

**بەدەستەواو**[2]: ئاوەڵکار. بە هاوکاری ☰ با همکاری

**بەدەستەوە / be destewe/**: ئاوەڵناو. بەدەستەوە؛ حازر و ئامادە ☰ آمادە

**بەدەسک / bedesik/**: ئاوەڵناو. قولفدار؛ دەسکدار؛ بەهەنگل ☰ دستەدار

**بەدەسەڵات / be deselat/**: ئاوەڵناو. دەسڕۆیشتوو ☰ بانفوذ

**بەدەسەوە / be desewe/**: ☜ بەدەستەوە

**بەدەعیە / be de'ye/**: ئاوەڵناو. فیزن؛ لەخۆبایی ☰ مغرور

**بەدەق**[1] / bedeq/: ناو. کووتاڵی کەتیراوی ☰ پارچەی آهارزدە

**بەدەق**[2]: ئاوەڵناو. ١. شەق و تورت و لە گەشە ٢. ساخ و بەدەماخ ☰ ١. تُرد و شاداب ٢. شاد و سلامت

**بەدەگمەن / bedegmen/**: ئاوەڵکار. بە عاستەم؛ تاکوتووک ‹لە هەزار کوڕ بەدەگمەن هەڵکەوتووە کە بابی پیری پەککەوتەی خۆی بحاوێنێتەوە و بلاوێنێتەوە «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ بە ندرت

**بەدەل / bedel/**: ئاوەڵناو. نەڕاستی ☰ بدل

**بەدەڵ / bedeł/**: ئاوەڵناو. ناجسن ☰ بَدَل

**بەدەم**[1] / bedem/: ئاوەڵناو. ١. بەلەزخۆر؛ زۆرلەوەڕ ٢. *[مەجاز]* دەمهەراش ٣. قسەزان ☰ ١. تُندخور ٢. زبان‌دراز ٣. سُخندان

**بەدەم**[2]: ئاوەڵکار. وەدەم؛ وێڕای؛ لەگەڵ ‹لەسەر خۆ چوو بەدەم گریانەوە دڵ/ گەرەک پڕ بوو کە ئەم مندالە دەرکەوت «مەحوی»› ☰ سرگرمِ

**بەدەماخ / bedemax/**: ئاوەڵناو. بەدەماغ: ١. کەیفخۆش؛ چەلەنگ؛ زۆر ساز و کۆک ٢. بەهێز و قەڵەو؛ دژی لەڕ و لاواز ☰ ١. سرحال ٢. تنومند

**بەدەماخی / bedemaxî/**: ناو. خۆشی؛ دلخۆشی ☰ شادی

**بەدەمار / bedemar/**: ئاوەڵناو. ١. بەغیرەت؛ بەحوزم؛ مێرخاس ٢. بەفیز و لەخۆبایی ☰ ١. باغیرت ٢. مُتکبر

**بەدەماغ / bedemağ/**: ☜ بەدەماخ

**بەدەموپل / be dem û pil/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دەمپاراو؛ بەدەموزوان ☰ فصیح

**بەدەمودوو / be dem û dû/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* خۆشڕاوێژ؛ قسەڕەنگین ☰ سُخندان

**بەدەموزوان / bedem û z(i)wan/**: ☜ بەدەموپل

**بەدەن / beden/**: ناو. ١. لەش؛ قالب ٢. دیواری بەرزی حەوش ☰ ١. تن؛ بدن ٢. دیوار بلند

**بەدەنداز / bedendaz/**: ئاوەڵناو. نالەبار؛ ناحەز؛ دزێو ☰ زشت

**بەدەو / bedew/**: ئاوەڵناو. ١. جوانچاک؛ خوشیک؛ خوشکۆک؛ شیرین ٢. خۆشبەز؛ خۆشڕەو؛ چەلەک ‹ناوی ساحیبقەرانی خاسی ئەوە/ چونکە لەم عەرسە ئەسپی ئەو بەدەوە «حاجی قادر»› ☰ ١. زیبا ٢. رهوار

**بەدەوام / bedewam/**: ئاوەڵناو. خۆڕاگر؛ مەندۆخ ☰ استوار

**بەدەهەند / be dehend/**: ئاوەڵناو. دەهەندە؛ دلاوا ☰ بخشندە

**بەدی**[1] / bedî/: ناو. خراپی؛ خراوی؛ بەیی ‹بەدیم چەس؟ گەردوون بەد کرد وەگەردم/ تا کەی خوین دل مەدەی وەخوەردم؟ «شامی»› ☰ بدی

**بەدی**[2]: ئاوەڵناو. ئاشکرا؛ ئاشکار؛ ڕوون ☰ پدید؛ پدیدار

⊡ **بەدی کردن**: کردنە چاو؛ بینین؛ دیتنەوە ‹خەمڕەوێنێک لێرە من ناکەم بەدی/ چۆن پەنا بۆ مەی نەبەم ساقی ئەدی؟! «هێمن»› ☰ دیدن؛ مُشاهدە کردن

**بەدی هاتن**: هاتنە دی؛ دروست بوون ☰ بە وجود آمدن؛ پدید آمدن

**بەدی هێنان:** هێنانە دی؛ دروست کـردن ☰ بـە وجود آوردن؛ پدید آوردن

**بەدی**[2]: ئاوەڵکار. بەرێ؛ ئارێ ‹ـ نـەچووی؟ ـ بـەدی چووم› ☰ چرا؛ آری

**بەدیل / bedîl/**: ناو. نۆرە؛ نۆبە؛ نۆگە؛ سـەرە؛ سـرە ☰ نوبت

**بەدیمەن / bedîmen/**: ئاوەڵناو. دەشە؛ دیمەنجوان ☰ خوش‌منظر

**بەدین / bedîn/**: ئاوەڵناو. دیندار؛ لەخواترس ☰ مُتدیّن

**بەدیومن / bedyum(i)n/**: ☜ **بەدئۆغر**

**بەدیهێنەر / bedîhêner/**: ناو/ ئاوەڵناو. خولـقێنەر؛ ڕانەر؛ فەداندەر ☰ پدیدآورندە

**بەدێلڤانی / be dêlvanî/**: ☜ **بەدەستەواو**[1]

**بەر**[1] **/ ber/**: ناو. ١. سنگ و بەرۆک ٢. میوەی دار و بێستان ‹بیدی مەجنوونە وجوودم لـە هـەموو بـەر بەرییە/ نە کەسێ مونتەفیعی یەک بەری یا سێبەرییە «نالی»› ٣. تۆڵ؛ پز ‹بزنەکە بەری هاویشت› ٤. لا؛ تەرەف؛ ڕەخ ‹وەرە ئەم بـەر› ٥. وەر؛ پانـا؛ پـانی؛ پانتایی؛ هەرایی ‹ئەم کووتاڵە بەری تەسکە، ئـەویان بەری پانە› ٦. بەرد؛ کوچک؛ تەوەن ‹چ ئەسـەر دێ ل بەرێ خارە بکەت قەترەیێ ئاب/ قەلەمێ مە ب دوو ـ سێ قەترەیێ زوها د چ کەت؟ «مـەلای جزیـری»› ٧. بەرک؛ گوللەی چەکی ئاگرین ٨. پیلی وشکی چرادەستی و ڕادیـۆ ٩. ئاسـەڕ ‹کەواکـەت بـەری هەیە؟› ١٠. دەرگا؛ دەری ١١. ڕووی تەماشا ‹بەر کە ئـەم لاوە!› ١٢. بـەهرە و داهـات ‹بـەر و بـۆت ئەمساڵ چۆن بوو؟› ١٣. بەرگەدە ‹مووی بـەر› ١٤. بۆری سەرپیت لە نووسـیندا ‹سـەر و ژێـر و بـەر› ١٥. بەش؛ پار ‹نان بەرم دەکەوێ، ڕاوەسـتم؟› ١٦. بەردەم ‹ئاگات لە بەر و دوای خۆت بێ!› ١٧. تـەن ‹ئامادەیی مەیدانم و ئەم بەرگە کە پۆشیم/ کفنە، نـە وەکوو چاکەت و پانتۆلە لە بـەرما «قـانع»› ١٨. وەر؛ دەرخ؛ بیر ‹لە بەر بوون› ١٩. ئەو ئەندازە لە دەغڵ کە پاڵە لە دروێنەدا دیاری دەکا بۆ کار لـە سـەر کردن ‹هەتا چاشت دوو بەری باشمان پەڕاند› ☰ ١. سینه ٢. میوه؛ ثمر ٣. جَنین ۴. طرف؛ سو ۵. عـرض؛ پهنا ۶. سنگ ۷. فشنگ ۸. باطری ۹. آستر ۱۰. درب ۱۱. رو؛ سمت نگاه ۱۲. حاصـل ۱۳. زهـار ۱۴. ضَمّه ۱۵. سـهم ۱۶. جلـو؛ روبـرو ۱۷. تـن ۱۸. حفـظ ۱۹. بخشی از مزرعه که دروگـر بـرای درو کـردن تعیـین می‌کند.

⊡ **بەر ئاویتن:** ☜ **بەر خستن**

**بەر پێ گرتن:** سەرەڕێ گرتن ☰ سـر راه کسـی/ چیزی را گرفتن

**بەر تاشین:** ١. بەرد برین ٢. بەرگەدە تاشین ☰ ١. سنگ تراشیدن ٢. موی زهار گرفتن

**بەر خستن:** بەراویتن؛ بەر ئاویتن؛ بەر هاویشتن؛ بەر وسەی؛ بەر وەنن؛ بێچوو بە مردوویی فـڕێ دان ☰ بچه انداختن؛ سقط کردن جنین

**بەر خواردن:** ١. بەهرە بردن ٢. میوە خواردن ٣. کرێی باغ دان ٤. نارەحەت بوون لە قسـە یـان جوڵانـەوەی کەسـێ ☰ ١. بهـره بـردن ٢. ثمـر خوردن ٣. اجارەی باغ دادن ۴. متأثر شدن از سخن یا کار کسی

**بەر داخستنەوە:** ١. چەرخاندن؛ هەڵـگەڕاندنەوەی فەرش لـە سـەر دارە تـەون تـا تـەنراو کەوێتـە پشتەوە و لە خوارەوە دەست بکەنەوە بە کـار ٢. تەکمیش کردنی دێراوی بێستان؛ فش و بـۆش کردنەوەی خاکی بێسـتان ☰ ١. پـایین کشـیدن قالی بافته روی دار قالی ٢. سُست کردن خاک جالیز

**بەر دان:** سەمەر دان ☰ ثمر دادن

**بەر دڵ گرتن:** برسـییەتی ڕەواندنـەوە ‹دوو دانـە هەنجیرم خوارد بەردڵمی گـرت› ☰ رفع گرسنگی کردن

**بەر فڕێ دان:** بەراویتن؛ منداڵ خسـتن ☰ بچـه انداختن؛ سقط کردن

**بەر کردن:** لە بەر کردن ‹کێ قەدری شیعری ئێمە دەزانێ بەری بکا؟/ هەر ساحیبە لەبەرکەری کالایی بێ‌ڕەواج «مەحوی»› 🇮🇷 از حفظ کردن

**بەر کەفتن:** ۱. بەش پێ گەیشتن ۲. نۆرە کەوتن 🇮🇷 ۱. سهم رسیدن ۲. نوبت رسیدن

**بەر کەوتن:** ۱. وێکەوتن؛ لێ‌دان ‹برۆی ئەو شۆخە ئەمڕۆ تێغی کێشا/ نەجاتی دا بە ڕەحمەت هەرچی بەر کەوت «مەحوی»› ۲. بەش پێ گەیشتن؛ بەش گەیشتنە بەشدار ‹سالێکی وا تازەم دەوێ/ کە کورد بەهاری بەر کەوێ «پیرەمێرد»› ۳. وە بن کەوتن ‹دەستم بەر چەرخ کەوت› ٤. نۆرە کەوتن؛ نۆبە هاتن ‹جارێ بەرم ناکەوێ بچمە ژوور› 🇮🇷 ۱. اصابت کردن ۲. سهم رسیدن ۳. زیر افتادن ۴. نوبت رسیدن

**بەر کەواندن:** پێکان 🇮🇷 بە هدف زدن

**بەر کێشان:** ژێری خەرمانکوت دەردان بە خەرمانکێش 🇮🇷 زیر خرمنکوب را روفتن

**بەر گرتن:** ۱. بەر پێ گرتن ‹بەریان گرتم نەمتوانی بڕۆم› ۲. بەرگری کردن ۳. بەرگە گرتن؛ خۆ ڕاگرتن و توانست لە بەر دژواری یان لە بەرانبەر لە خۆ بەهێزترەوە ‹موژەت قوللابی گیرا، زولفی دلگیرت کەمەندئاسا/ مەحاڵە بەرگرێ یا بەر ببێ کەس کەوتە بەر گیرت «مەحوی»› ٤. میوە دانی دار و... ٥. ئاوی زاخ لە کووتاڵی ڕەنگ‌کراو دان بۆ کاڵ نەبوونەوەی 🇮🇷 ۱. مانع شدن ۲. دفاع کردن ۳. تاب آوردن ۴. ثمر دادن درخت ۵. زاج زدن برای ثابت ماندن رنگ پارچە

**بەر وسەی:** ☜ بەر خستن

**بەر وەنن:** ☜ بەر خستن

**بەر هاویشتن:** ☜ بەر خستن

**کردنە بەر:** پۆشین ‹چیا و دۆڵ و دەشت و دەر/ بەرگی ڕووناکی کردە بەر «بێکەس»› 🇮🇷 پوشیدن

**بەر**[۲]: ↓

⊡ **بەر بوون:** ۱. ئازاد بوون لە زیندان ۲. بەرهەڵدا بوون؛ بێ‌خاوەن بوون ‹سەروەر و سەرکردە نییە، لاتێکە لەو دەشتە بەر بووە! «پەشێو»› ۳. ڕەوان بوونی تراو ‹خوێن لووتی بەر بوو› ٤. تەواو بوونی کاتی کار و چالاکییەک ‹منداڵەکان بەر بوون، هاتنەوە› ٥. لە بەندێ دەرهاتن ‹کەرەکە بەر بوو، ڕاکە بیگرە!› ٦. پێوە بوون ‹عیشق ئاگرێکە بەر بووە هەر کەس، دەبێ بە کەس/ گەر ڕۆژەڕەش وەکوو شەوە بێ، بوو بە شەوچراغ «مەحوی»› 🇮🇷 ۱. آزاد شدن ۲. بی‌صاحب بودن؛ یلە بودن ۳. روان شدن مایع ۴. مرخص شدن ۵. ول شدن ۶. درگرفتن

**بەر بوونەوە:** ۱. بەرەوە بوون؛ داکەوتن؛ کەوتنە خوار؛ شۆڕ بوونەوە ۲. سەربەرەخوار هاتن 🇮🇷 ۱. افتادن ۲. رو بە پایین آمدن

**بەر دان:** ۱. لێکۆڵینەوە ۲. بەرەڵا کردن ‹لەم بەحری فیتنە بەلکی نەجاتت بدا خودا/ داوێنی باخودا بگرە! بەردە ناخودا! «مەحوی»› ۳. تێ بەر دان؛ بەرهەڵدا کردن و دنە دانی سەگ بەرەو شتێ ‹خوێنی هاوخوێنت ئەڕێژی نۆکەری ئەگریتە دەس/ هەی سەگم بەردایە زێڕ و لیرە و دیناری تۆ! «قانع»› 🇮🇷 ۱. بررسی کردن ۲. رها کردن ۳. سگ را بە چیزی پاس دادن

**بەر داین:** چاوەدێری کردن؛ ئاگاداری کردن 🇮🇷 نظارت کردن

**بەر**[۳]: ئاوەڵکار. لە بەر یان بەرانبەری دیکەوە ‹کاکم کەوتە بەر؛ نە پای وەوراوان وەختێو مەن مەو بەر/ ڕەنگەم سەوزەنە نە ڕووی وەرکەمەر «سەیدی»› 🇮🇷 جلو

⊡ **بەر لە:** پێش لە 🇮🇷 قبل از

⊡ **بەر دان:** بەرەڵا کردن 🇮🇷 رها کردن

**بەر دانەوە:** ۱. لە ژووردا فڕێ‌دانە خوار ۲. ئاو لە ئەستێر بەرەڵا کردن 🇮🇷 ۱. پایین انداختن ۲. آب

استخر را خالی کردن

**کەوتنە/ کەفتنە بەر:** وە پێش‌کەوتن ☰ جلو افتادن

**بەر[4]:** ئامراز. لە ژێر کاریگەریی ‹کە وا کەوتە بەر شەپۆلی هەستی من/ لەو ڕۆژەوە هەر نوقم ئەبێ بەرەو بن «گۆران»› ☰ تحت تاثیر

**بەر[5]:** پێشوشە. پێوەندار یان سەر بە بەرەوە ‹بەربەیان؛ بەرخۆر؛ بەرکۆ› ☰ پیش ـ

**ـ بەر[6]:** پاشوشە. ١. هەڵگر؛ کێش ‹بارەبەر؛ ڕەنجبەر› ٢. ببەر ‹دلبەر؛ ڕێبەر› ☰ ١و٢. ـ بَر

**بەر[7]:** پێشگر. ١. دەر ـ ‹بەرئامای› ٢. خاوەن بار یان حاڵەتێک ‹بەردەوام؛ بەرقەرار؛ بەرکەنار› ٣. دەکەوێتە پێش کەرتێکی ڕێزمانییەوە وشەیەکی دیکە ساز دەکا ☰ ١. در ـ ٢و٣. بر ـ

⊡ **بەر ئامای:** دەرهاتن ☰ بیرون آمدن

**بەر[8]:** پێرۆ. ← **دەوروبەر؛ سەروبەر**

**بەرئاڤ / ber'av/:** ناو. قەراغ زەریا ☰ کنار دریا

**بەرئاگر / ber'agir/:** ناو. کۆڵەوەژ ☰ چوب آتش به هم زدن

**بەرئاو / ber'aw/:** ناو. گیای قناولێ کە بۆ چڵکی سی باشە ☰ مندآب

**بەرئاواڵە / ber'awałe/:** ئاوەڵناو. ولاشم؛ وەلاشم ☰ روباز

**بەرئەنجام / ber'encam/:** ناو. نیوانە؛ ناونج؛ ئەوی لە ناوەڕاستدایە ☰ میانگین

**بەرئەندام / ber'endam/:** ناو. کاندیدا ☰ کاندیدا

**بەرئێخە / ber'êxe/:** ناو. وەرومەوە؛ پێسیر ☰ گریبان

**بەرابەر / beraber/:** ☜ **بەرامبەر**

**بەرات / berat/:** ناو. ١. مزی وەرزی ڕەنجبەر ‹ئاغا دەستی برد، چوار دینار پارە/ بەراتی فەرموو بۆ ئەو بێچارە «قانع»› ٢. جیرەی هەمیشەیی ‹بەراتی ئەم مانگەمان تا ئەورۆ نەهاتووە!› ٣. کاری ڕزق و ڕۆزی بەش کردن ‹نیوەی مانگی شابانێ، شەوی جێژنی بەراتێ/ لە خودای دەکەم تەڵەبێ بەشکوو چاوجوانم داتێ «فولکلۆر»› ٤. حەواڵەی پوولی ☰ ١. مُزد ٢. مُقرری ٣. تقسیم روزی ۴. حواله

**بەراتخۆر / beratxor/:** ئاوەڵناو. فەرمانبەری بەمز؛ کارکەری دەوڵەت یان خان ☰ مُزدبگیر

**بەراتە / berate/:** ناو. بەلاتە؛ لاشی تۆپیوی فڕێدراو ☰ لاشەی مُردار

**بەراتی / beratî/:** ناو. جیرەی دایمی ☰ مُستمری

**بەرادان / beradan/:** چاوگ. لێڕوانین؛ تەمەشا کردن؛ تماشا کردن؛ لێنۆڕین ☰ نگاه کردن

**بەراردەی / berardey/:** چاوگ. ١. هەڵکەندن؛ کۆلین ٢. دەرهێنان ☰ ١. کندن ٢. درآوردن

**بەراز / beraz/:** ناو. ١. خوو؛ خووگ؛ خێگ؛ گاکول؛ گورگاز؛ وەراز؛ واش؛ هەرکام لە گیانەوەرانی تیرەی بەراز (کێوی و ماڵی) ٢. ئاژەڵێکی گوانداری بێ‌شاخی لمۆز درێژ، شفرەدار، جەستە قورس، چوارپەل کورت، پێست تۆکمە و تیسکنە و لە زۆر ولاتان بۆ گۆشت و چەوری و پێست و تووکەکەی دابەستە دەکرێ ٣. /مەجاز/ زۆر هار و بەکار و بەدفەڕ ☰ ١. گراز ٢. خوک ٣. زیرک و بدذات

**بەرازخۆر / berazxor/:** ناو. /کینایە/ ئەهلی حەق؛ کاکەیی ☰ اهل حق

**بەرازە / beraze/:** ناو. ١. کەڵیی یەکسم کە لە شەش ساڵیدا دێت ٢. دارێ کە بەرداشی پێ بەرز دەکەنەوە ٣. ملغە؛ لۆسە؛ باری ٤. کاریتە ٥. قایشی جووت لە شوولی بادراو ٦. سەرکۆڵەکە؛ تانج کۆڵەکە؛ تەختە داری کورت و قەوی لە بەینی کۆڵەکە و کاریتەدا ٧. ئاغزوونە؛ ئاخزوونە ☰ ١. ناب اسب شش ساله ٢. چوب حمل سنگ آسیاب ٣. اهرُم ۴. بالار ۵. بند خیش از ترکەی بافته شده ۶. سرستون ٧. سگک

**بەراژۆ / berajo/:** ئاوەڵناو. بەرەوژوور؛ سەرەوژوور ☰ سربالا

**بەراش / beraş/**: ناو. بەرداش؛ کوچـک ئاسـیاو ☰ سنگ آسیاب

**بەراشۆ / beraşo/**: ناو. جل‌وبەرگێ کە بۆ شوشـتن دانراوە ☰ رخت چرک

**بەراشە / beraşe/**: ناو. جـۆرێ باڵـندە ☰ پرنـده‌ای است

**بەراڤ[١] / berav/**: ناو. ١. بەردە زوورەی تـیخ تیـژ کردن ٢. شیو و کوڵ ٣. زەمینی بەراو ٤. پـەڕاو؛ قەراخ زەریا ☰ ١. سـنگ سـوهانی ٢. رختشـویی ٣. زمین آبی ۴. ساحل دریا

**بەراڤ[٢]**: ☜ **بەراو[٢]**

**بەراڤی / beravî/**: ناو. ١. کۆڕ؛ جـوات؛ جڤـات ٢. ڕەوتی کۆ بوونەوە ☰ ١. گردهمایی ٢. اجتماع

**بـەراڤیک / beravîk/**: نـاو. سـوێنکە سـابوون ☰ تەماندەی صابون

**بـەراڤێرک / beravêrk/**: نـاو. دیـاری جێژنــە ☰ کادوی عید

**بـەراڤێژک / beravêjik/**: نــاو. بەرهاڤــێژک؛ زێڕەوشان ☰ زرافشان

**بەراڵوک / beraɫûk/**: ☜ **بلاڵوك**

**بەرام / beram/**: ☜ **بەرامە**

**بەرامبـەر[١] / beramber/**: نـاو. بەرانبــەر؛ بەرابــەر ‹بروانە بۆ بەرامبەرت!› ☰ برابر؛ مُقابل

**بەرامبەر[٢]**: ناوەڵناو. بەرابەر؛ بەرانبەر؛ یەکسان؛ ڕێک ‹زۆرمان بەرامبەرە› ☰ برابر؛ مُساوی

**بەرامبەر[٣]**: ناوەڵکار. بەرابەر؛ بەرانبەر؛ لە بەرامبەردا؛ لـە بەرامبــەرەوە ‹بەرامبــەرم دامەنیشـە! جـەرگت دەرهێنام لە ڕیشە «فولکلۆر»› ☰ برابر؛ مُقابل

**بەرامبەر[٤]**: ئامراز. بەرابەر؛ بەرانبەر؛ بەرامبــەری؛ لـە بەرامبـــەر ‹پەلکەزێرینــەی پــاش بــارانی زۆر/ چەماوەتەوە بەرامبەر بە خۆر «گـۆران»› ☰ برابـر؛ در برابر

**بەرامبەرکراو/ beramberk(i)raw/**: ☜ **بەراوردی**

**بەرامبــەرکێ / beramberkê/**: نــاو. ١. کــاری پێک‌گرتن و بە بەر یـەک هەڵکێشـان ٢. ملـە و کێبەرکێ؛ ڕکەبەرکێ ☰ ١. مُقابله ٢. مُسابقه

**بەرامبەری / beramberî/**: ناو. بەرانبەری: ١. وەک یەکی ٢. کاری بە گژدا چوون و لە ڕوودا وێستان ☰ ١. برابری ٢. ایستادگی

**بـەرامپێل / berampêl/**: نـاو. بەروانکـە؛ بـەرانپێل؛ بەرهەڵبێنە ☰ پیشبند

**بەرامـە / berame/**: نـاو. بـەرام؛ بـۆنی خـۆش ☰ نکهت؛ بوی خوش

**بـەران / beran/**: نـاو. ١. وەران؛ نێرەمــەڕ؛ قــۆچ؛ پەزی نێر ٢. ئامرازێکە لە هەوجاڕدا ☰ ١. قـوچ ٢. ابزاری در خیش

**بەرانپیچ / beranpêç/**: ناو. بـەرەوپێل؛ بـەرانپێل؛ بەروانکە ☰ پیشبند کار

**بەرانبەر / beranber/**: ☜ **بەرامبەر**

**بەرانبەری / beranberî/**: ☜ **بەرامبەری**

**بـەران پۆر / beranpor/**: نـاو. کــەپۆی کــووڕی دەرپەڕیو ☰ دماغ عقابی

**بـەرانپێچ / beranpêç/**: نـاو. بـەرانپێل؛ بـەرانپێل؛ بەروانە؛ بەروانکە ☰ پیشبند

**بەرانپێل / beranpêl/**: ☜ **بەرانپێچ**

**بەرانپێڵ / beranpêɫ/**: ☜ **بەرانپێچ**

**بەرانخواز / beranx(i)waz/**: ☜ **بەبەران**

**بەرانکێ / berankê/**: ناو. بەرانەک؛ قامکە گـەورە؛ سپێ‌کوژە ☰ انگشت شست

**بەرانگە / berange/**: ناو. مـۆڵ؛ مۆڵـگەی ڕان لـە دەشت ☰ جای آسودن رمه در دشت

**بەرانگیر / berangîr/**: ناو. تووشیار؛ تـووش‌هـاتوو؛ تووش‌بووگ ‹بەرانگیر بوون› ☰ مواجه

**بەرانەک / beranek/**: ☜ **بەرانکێ**

**بەرانەکێوی / beranekêwî/**: ناو. نێری مەڕە کێوی ☰ قوچ کوهی

**بەرانێ / beranê/**: ناو. قامکەگەورە؛ تلیا مـەزن انگشت شست

**بەراو[1] / beraw/**: ناو. ١. زەمـینی ئـاوی ‹بـەراو و ئەرزی ئێوە کیمیایە/ دوڕ و گەوهەر، گەزۆ و مـازووی چیایە «حاجی قادر»› ٢. لای خوارووی جۆگە کـە شێلەگەی لێ هەڵدەبەستن ١. زمـین پُـرآب ٢. طرف پایین جوی

⊡ **بەراو دان**: پێش بە ئاو گـرتن لـە ئاودێریـدا جلو آب را گرفتن در آبیاری

**بەراو[2]**: ئاوەڵناو. بەراڤ: ١. هەڵکەوتوو لـە بەرانبـەر ئاودا؛ بەر ئاو کەوتوو ٢. بە ئاو دێراو ‹ئـەم زەمینـە دێمـە، ئـەویان بـەراوە› ٣. *[مـەجاز]* جـێ‌جـوێن و چەقاوەسـووو ١. در معـرض آب ٢. آبـی ٣. فحش‌خور

**بەراوبەری / berawberî/**: ☜ **بەرەبەری**

**بەراوپشت[1] / berawpişt/**: ئاوەڵـناو. ١. بـەراوەژوو؛ واژی؛ سەرنخوون؛ بـەرەواژی ٢. هەڵـوگەڕاو ١. واژگون ٢. پشت‌ورو

**بەراوپشت[2]**: ئاوەڵکار. ١. دواوەدوا ٢. هەڵگەڕاوە ١. عقب‌عقب ٢. پُشت‌ورو

**بەراورد / berawird/**: نـاو. ١. کـاری لێکدانـەوە؛ تاقی کردنەوە ‹بەراوردی بکە بزا چەن دانەیـە؟› ٢. کاری بـە خـەیاڵ هەڵسـەنگاندن؛ نرخانـدن ‹بـە بەراوردی من، بـەشمان ناکـا› ٣. کـاری بەرامبـەر یـەک دانـان و هەڵسـەنگاندن بـە پێـی یـەک ‹بەراوردیان کردن؛ ئەمیان باشترە› ١. سنجش ٢. برآورد؛ تخمین ٣. تطبیق

**بـــەراوردکراو / berawirdk(i)raw/**: ئاوەڵــناو. خەملاو؛ قرساو؛ قەبلاو ارزیابی‌شده

**بەراوردکـەر / berawirdker/**: نـاو. خەمڵـێن؛ قەرسێن برآوردکننده

**بەراوردی / berawirdî/**: ئاوەڵناو. بەرامبەر بە یـەک هەڵسەنگێنراو؛ بەرامبەرکراو ‹ئـەدەبی بـەراوردی› تطبیقی

**بەراوەرد / berawerd/**: ناو. خەمل؛ خـەمڵ؛ کـار و ڕەوتی قەرساندن برآورد؛ ارزیابی

**بـەراوەژۆیی / berawejoyî/**: نـاو. ڤـاجایی؛ وەگەڕاوی؛ ئاوەژوویی واژگونی

**بـەراوەژوو[1] / berawejû/**: ئاوەڵـناو. بـەراوەژی؛ بـەرەواژی؛ بەراوپشـت؛ واژی؛ سـەرەوخوار ‹کوڕەکەت کارەکانی بەراوەژووە!› وارونه

**بـەراوەژوو[2]**: ئاوەڵـکار. بـەراوەژی؛ بـەرەواژی؛ بەراوپشـت؛ سـەرەوخوار؛ واژی ‹ژێرکراسـەکەت بەراوەژوو دەبەر کردووە› وارونه

**بەراوەژی / berawejî/**: ☜ **بەراوەژوو**

**بەراوی / berawî/**: ئاوەڵناو. ئاوی آبی

**بەراوێتن / berawîtin/**: ☜ **بەر خستن**

**بەراوێتە / berawîte/**: ئاوەڵـناو. بەرخسـتوو سقط‌کرده

**بەراهی / berahî/**: ناو. بەرایی: ١. پێشایی ئاو یـان لەشـکر ٢. پێشـەوەی ڕانەمـەڕ ٣. پێشـڕەوی کارەوان ١تا٣. پیشاهنگ

**بەرایی / berayî/**: نـاو. ١. بـڕوایی؛ ئیجـازە ‹دڵـم بەرایی نادا بچم› ٢. سەبووری؛ ئۆقرە ‹ساڵێک لـەو کارەساتە گوزەراوە، دڵی بەرایی نەهاتووە› ٣. دۆخی ڕێ پێ دان ‹لە سەر بەرایی بـابی چـووە خوێنـدنی ئـایینی› ٤. پێشـەکی؛ پێشـبڕ ٥. بـەرفراوانی ٦. ☜ **بەراهی** ١. اجـازە ٢. صبوری ٣. موافقـت ٤. درامد؛ مقدمه ٥. وسعت ٦ ☜ **بەراهی**

**بـــەرایی‌دەر / berayîder/**: نـاو. ڕێـدەر رخصت‌دهنده

**بەربا[1] / berba/**: ناو. دەنکی پووچەڵ کە لە شـەن کردندا با دەیبا دانەی پوک کە باد می‌برد

**بەربا[2]**: ئاوەڵناو. ١. تایبەتمەندی خۆیان لـە کـاتی هەڵاویشتنا ٢. هیچ بە سەر هیچەوە نەماو ‹کەس نازانـێ چ باسـە، بەربایـە!› ١. بـاد دادە (کسـتەی

خرمن) ٢. شیرتوشیر

**بەرباد** / berbad/: ئاوەڵناو. بێزەلەت؛ لە کەڵک و کارکەوتوو؛ هیچ پێوە نەماو ‹عومرم بەربادە!› تباه

⊡ **بەرباد کردن**: لە کەڵک خستن؛ لە بەین بردن بر باد دادن

**بەربار**[1] / berbar/: ناو. یەکسمی سێ ساڵە (ساڵی گرتن و بار کردنی بارەبەر) ستور سه ساله

**بەربار**[2]: ئاوەڵناو. ١. *[مەجاز]* گوێلەمست؛ فەرمانبەر ٢. ڕام؛ ئارام ‹گەورەم، وتی دامەنیشە خەمبار/ کار وا نییە بۆت نەیێتە بەربار «هەژار، *مەم و زین*»› ١. فرمانبر ٢. رام

**بەربازن** / berbazin/: ناو. دەستەوانەیەک کە ناهێڵێ بازن هەڵخلیسکێ و خلەخل بکا النگوگیر

**بەربالاڤ** / berbalav/: ناو. فۆتە و خاولی گەرماو لنگ و فوتەی حمام

**بەربانگ**[1] / berbang/: ناو. ١. کاتی ڕۆژوو کردنەوە ٢. کاری ڕۆژوو شکاندن ٣. بەیانی زوو؛ شەوەکی ٤. سەرەتای شەو ١. وقتِ افطار ٢. افطار ٣. صبح زود ۴. اول شب

**بەربانگ**[2]: ئاوەڵکار. بەیانی زوو؛ شەوەکی ‹بەربانگ هەستام و کەوتمە ڕێ› صبح زود

**بەربایی** / berbayî/: ئاوەڵناو. بەرچاو؛ خۆیا؛ ئاشکرا آشکار

**بەربجاڤ** / berbicav/: ئاوەڵناو. بەسام؛ ترسناک ترسناک

**بەربچاڤ**[1] / berbiçav/: ناو. سەرکار؛ ئەو کەسەی ڕادەی مافی ئاغا یان دەوڵەت لە ماڵی کاسب و ڕەنجبەران دیاری دەکا مُمیز مالیاتی

**بەربچاڤ**[2]: ئاوەڵناو. بەرچاو: ١. دیار؛ لە بەر چاو ٢. گرینگ ١. پیدا ٢. چشمگیر

**بەربچان** / berbiçan/: ئاوەڵناو. نارێک؛ نەگونجاو؛ تەوش؛ ئاڵۆز؛ ناساز لەگەڵ قانوون یان دابی کۆمەڵگادا ناهنجار

**بەربخۆر** / berbixor/: ناو. پەلەوەرێکە پرندەایست

**بەربڕ**[1] / berbiř/: ناو. نەقار؛ بەردتاش؛ سەنگتراش؛ کەڤرتراش سنگتراش

**بەربڕ**[2]: ئاوەڵناو. بەرگر؛ لەمپەر مانع

**بەربڕۆچکە** / berb(i)řoçke/: ☜ **بەربەڕۆچکە**

**بەربژار** / berb(i)jar/: ئاوەڵناو. ناودێر؛ ناڤدایی؛ ناولەسەر ‹فیلمە بەربژارەکان بۆ خەڵاتی ئوسکار!› کاندید

**بەربسک** / berbisk/: ناو. ئەگریجە؛ قژی لاسەر گیس دو سوی صورت

**بەربڵاو** / berb(i)ław/: ئاوەڵناو. پان و بەرین ‹حاڵی کردم کوردی زمانێکی ڕەوان و بەربڵاو و دەوڵەمەندە «هێمن»› وسیع

**بەربڵاوی** / berb(i)ławî/: ناو. فرەهی؛ گوشادی فراخی

**بەربنار** / berb(i)nar/: ناو. پاڵداوێنی کێو ‹سەیرانکەران بەهاران، کە دەچنە بەربناران/ بە چۆپی پۆلەداران، عومر دەگێڕنە دواوە «پیرەمێرد»› کوهپایه

**بەربوارد** / berb(i)ward/: ئاوەڵناو. بەربوورە؛ بەربواردوو؛ بەردیل کە ساڵێ ئاوس بوونی بواردبێ یک سال آبستن نشده (دام)

**بەربواردوو** / berb(i)wardû/: ☜ **بەربوارد**

**بەربودی** / berbudî/: ناو. پێخەسوو؛ پاخەسوو ینگه

**بەربۆر** / berbor/: ئاوەڵناو. تووشی گێچەڵ بووی بێ دەرەتان گرفتار مخمصەی لاعلاج

**بەربۆسە** / berbose/: ناو. نێوانی نێر و بۆسە ابزار خیش

**بەربۆغە** / berboğe/: ناو. بەرچێلە؛ بەرخەبەبە

غبغب

**بەربۆق** / berboq/: ناو. گۆنجە؛ نۆین؛ جۆی ئاوی داپۆشراو و بە وشترگەڵوو کێشراو ☰ مجرای آب سر پوشیده

**بەربو**[1] / berbû/: ☜ بەربوک

**بەربو**[2]: ئاوەڵناو. بەربووگ: ۱. بەرەڵا؛ بێکارە ۲. [مەجاز] بێئاکار؛ بەدخوو ۳. دەرباز؛ خەلسیو ‹دەستی بەربووی کچی گەڕی شاییم/ هەستی خنکاوی لاوی سەودابیم «هێمن»› ☰ ۱. وِل؛ یله ۲. بداخلاق ۳. رها؛ آزاد

**بەربودی** / berbûdî/: ☜ بەربوک

**بەربورە**[1] / berbûre/: ناو. ۱. ☜ بەربوارد ۲. پێشداوەری؛ ڕەوتی لە پێشەوە بڕیار دان ۳. گریمانە؛ پێشگرە ٤. بەرچین؛ کاری توو وەشاندن پێش کێلان ☰ ۱. ☜ بەربوارد ۲. پیشداوری ۳. پیش‌فرض ۴. تخم‌پاشی پیش از شخم

**بەربورە**[2]: ئاوەڵکار. ۱. بەربیر؛ بە خەیاڵ و گومان ۲. لە پێش؛ لە بەرووی ☰ ۱. حدسی؛ بر پایەی گمان ۲. پیشاپیش

**بەربوری** / berbûrî/: ناو. پێش‌بینی؛ خەبەر لە داهاتوو ☰ پیشبینی

**بەربوز** / berbûz/: ناو. بەرگووز؛ چۆغە؛ چۆخە؛ لە بووزوو چێکراو ☰ لباس از شال دستباف محلی

**بەربوک** / berbûk/: ناو. بزگێلە؛ بەربوودی؛ بووکنی؛ بەربوو؛ بەربوویک؛ بەربیک؛ پێخەسوو؛ پاخەسوو ‹دیسان بەربووکی سروشت بووکی بەهاری، بە هەزاران ڕەنگ و بۆن و عیشوە و ناز ڕازاندنەوە ... «حەقیقی»› ☰ ینگه

**بەربوکانە** / berbûkane/: ناو. خەڵاتی زاوا بۆ شاییگێڕ، کاتی گەیشتنی بووک ☰ شاباش داماد به مطرب، با رسیدن عروس

**بەربوگ** / berbûg/: ☜ بەربو[2]

**بەربوویک** / berbûwîk/: ☜ بەربوک

**بەربەت** / berbet/: ناو. ئامێری مووسیقایی ژێدار بە کاسەی گەورە و دەسکی کورتەوە کە بە زەخمە و قامک دەژنرا و دوای ماوەیێک عوود ـ بە نەختێ گۆڕانکارییەوە ـ جێی گرتەوە ‹خەلاسم کەن لە دەس غەم، موتریب ئامان/ بە دەنگی بەربەت و چەنگ و دەف و نەی «سالم»› ☰ بربط

**بەربەتاک** / berbetak/: ئاوەڵناو. ئاواڵە؛ وەکری ☰ باز؛ گشاده

**بەربەتاو** / berbetaw/: ئاوەڵناو. [کینایە] حەشەری؛ هۆکی؛ بەئاڵۆش؛ بە حەزی جنسی ☰ حشری؛ شهوتی

**بەربەخت** / berbext/: ئاوەڵناو. [کینایە] عازەوێ کە وەختی شوویە ☰ دم بخت

**بەربەر**[1] / berber/: ناو. سەرتاش؛ دەلاک ☰ سلمانی

**بەربەر**[2]: دەنگ. هەرای جووتێر بۆ لێخوڕین و ڕێک و ڕاست چوونی گاجووت بە سەر هێلێکدا ☰ بانگ راندن گاو شخم

**بەربەران** / berberan/: ناو. بەردیل؛ مەڕی سێ بەهار دیتوو ☰ گوسفند سه ساله

**بەربەرۆچک** / berberoçik/: ☜ بەربەڕۆچکە

**بەربەرۆچکە** / berberoçke/: ☜ بەربەڕۆچکە

**بەربەرۆژگ** / berberojg/: ☜ بەربەڕۆچکە

**بەربەرۆشک** / berberoşik/: ئاوەڵناو. [پەلار] سەرپیرێژن؛ تەمەڵی هیچ لێ نەهاتوو کە لە ماڵ دەرناچێ ☰ تنبلِ خانەنشین

**بەربەرۆک** / berberok/: ناو. بەربەرەوو؛ ئێخە ☰ یقه

**بەربەرو** / berberû/: ☜ بەربەرۆک

**بەربەرە** / berbere/: ناو. ۱. خێشک؛ ئەو دارە ئەستوورەی دە جووتی دەخەن و شۆی پێ ڕاست دەکەن ۲. وەروەرە؛ شەپالووخ؛ شاپەڵۆخ؛ بەفرەلۆ؛ پارۆئاسای پانی تایبەت بۆ بەفر ماڵین ☰ ۱. مالەی زمین صاف کن ۲. پارو مانندِ ویژەی برفروبی

**بەربەرەکانی / berberekanî/:** ☜ **بەربەرەکانێ**

**بەربەرەکانێ / berberekanê/:** ناو. بەربەرەکانی: ۱. بەرامبەرکێ؛ هۆملکێ؛ ڕووبەڕوویی؛ ڕووباری؛ ڕووبالی؛ بەرەنگاری؛ کاری لە ڕوودا ویستان ۲. ملە؛ کێبەرکێ؛ ڕکەبەری ☰ ۱. مقابلە ۲. مسابقە

**بەربەرەکانێکەر / berberekanêker/:** ئاوەڵناو. هاڤڕک؛ هومال ☰ رقیب

**بەربەرەڵا / berbereła/:** ئاوەڵناو. پێش‌ئاوەڵا؛ بەرنەگیراو؛ پاوان‌نەکراو ☰ آزاد و بدون انحصار

**بەربەڕۆچکە / berbeřoçke/:** ناو. بەربەرۆچک؛ بەربەرۆچکە؛ بەربەرۆژگ؛ ڕووبەڕۆژ؛ لاخوەر؛ بەربڕۆچکە؛ شوێنی خۆرگیر (بەربەڕۆچکەش هەیە، سەرمامە شەوان، من چ بکەم؟ ئەو منالانە کە بێ کراس و کەوان، من چ بکەم؟ «هەژار، *بۆ کوردستان*») ☰ جای آفتابگیر

**بەربەڕووی / berbeřûy/:** ☜ **بەرەوڕووی**

**بەربەژن / berbejn/:** ناو. دوعا و حەمایەلێ کە دە ملی دەکەن و دەچێتە سەر کەلەکە ☰ تعویذی کە بە گردن آویزند

**بەربەس / berbes/:** ☜ **بەربەست**

**بەربەست[1] / berbest/:** ناو. بەربەس: ۱. بەنداو؛ لەمپەری ئاو گەڕاندنەوە ۲. ڕێبەند؛ ڕێبەست؛ لەمپەری سەر ڕێگە ☰ ۱. سد ۲. راەبند

**بەربەست[2]:** ئاوەڵناو. بەربەس؛ بەربەستراو؛ بەرگیراو ☰ بندآمدە؛ مسدود

**بەربەستراو / berbest(i)raw/:** ☜ **بەربەست[2]**

**بەربەستی / berbestî/:** ناو. تەنگاوی؛ تەنگەبەری؛ تەنگژە؛ تەنگ‌وچەڵەمە؛ بێ‌دەرەتانی ☰ محدودیت

**بەربەسێڵ / berbesêł/:** ناو. بەربەسێلک؛ چێشتی گۆشت و ماست ☰ آش گوشت و ماست

**بەربەسێلک / berbesêłk/:** ☜ **بەربەسێڵ**

**بەربەش / berbeş/:** ناو. دەفر و ئامرازی کانزا ☰ ظرف فلزی

**بەربەفش / berbefiş/:** ئاوەڵناو. ۱. جلف؛ سووک ۲. خۆهەڵکێش ☰ ۱. جلف ۲. خودستا

**بەربەق / berbeq/:** ناو. لێوە گۆلەمەرەزە؛ لێواری گۆلی چەڵتووک بۆ ئاو بە هەموو لا گەیشتن ☰ جوب شالیزار

**بەربەقوڕە / berbequře/:** ناو. بەربەکوڕە؛ قوڵتە ☰ کمرکل

**بەربەکوڕە / berbekuře/:** ☜ **بەربەقوڕە**

**بەربەگوار / berbegiwar/:** ناو. ئاژەڵێک کە گۆشتێکی زیادی وەک گولینگ لە بەر ملیدا بێ ☰ دامی کە زیر گردنش گوشتی گوشوارە مانند داشتە باشد

**بەربەلەت / berbelet/:** ئاوەڵناو. سەرسووڕێن ☰ حیرت‌انگیز

**بەربەلا / berbeła/:** ئاوەڵناو. لە بەلاوە نزیک ☰ در کمین بلا

**بەربەن / berben/:** ناو. ۱. بەردەگۆنجە؛ کون‌ئاخنی ئەستێرک؛ دار یا بەردێ کە گۆنجەی ئەستێلی پێ‌دەگرن ۲. سینەڕێز؛ سینەبەند؛ گەردەن‌بەندی شۆڕ ۳. جۆرێ خورما ٤. خشڵی ژێرچەنە ☰ ۱. دهانەگیر استخر ۲. سینەریز ۳. نوعی خرما ۴. زیور زیر چانە

**بەربەند / berbend/:** ناو. بەروەن: ۱. سەد؛ بەنداو ۲. بەربەن؛ خشڵی ژێر چەنە ☰ ۱. سد ۲. زیور زیر چانە

**بەربەهەڤ / berbehev/:** ئاوەڵکار. بەرانبەر؛ ڕووبەڕوو ☰ روبرو

**بەربەیار / berbeyar/:** ئاوەڵناو. بۆرە ☰ بایر

**بەربەیان / berbeyan/:** ناو. بوومەلێڵ؛ شەوەکی؛ تاریک و ڕوون؛ هەوەڵی ڕۆژێ (لە هەموو ئاسمانا ئەستێرەی بەربەیان/ ئەخاتە دڵی من هەستێکی سپی و جوان «گۆران») ☰ پگاە

**بەربیر / berbîr/:** ئاوەڵکار. بەربوورە؛ بە خەیاڵ و

گومان ◼ حدسی؛ بر پایەی گمان

**بەربیک** / berbîk/: ☜ **بەربوك**

**بەربین** / berbîn/: ناو. بەربینگ؛ ستۆکرک؛ بن گەروو لە دەرەوە ‹چاوی کەوت بە برینم/ گیانم گەیبووە بەربینم «پیرەمێرد»› ◼ بیخ گلو

**بەربینگ** / berbîng/: ناو. بەربین ‹... هەوری ڕەش و چڵکن بەربینگی عاسمانیان بەر نەدەدا ... «هێمن»› ◼ بیخ گلو

**بەربێر** / berbêr/: ناو. شوان ◼ شبان

**بەربێڵ** / berbêł/: ناو. بەرەبێڵ؛ بەرجووت؛ بەرەجووت؛ بەروبوو؛ داهاتی زەوی ◼ محصول کشاورزی

**بەربێڵایی** / berbêłayî/: ناو. ١. هەیوان؛ بەر سەربانی بێ دیواری ئەم لا و ئەو لا ٢. شوێنی باران‌نەگر ◼ ١. ایوان ٢. باران‌پناه

**بەربێن** / berbên/: ناو. بەربێندە؛ بەن‌کەڵەوە؛ بەندکەڵەمە ◼ دهانبند گاو

**بەربێندە** / berbênde/: ☜ **بەربێن**

**بەربێنک** / berbênk/: ناو. بەروانکە ◼ پیشبند

**بەربێنکە** / berbênke/: ناو. بەروانکە؛ بەرەڵبێنە؛ بەرهەڵبێنە ◼ پیشبند کار

**بەرپا** / berpa/: ئاوەڵناو. ١. باز؛ دامەزراو؛ کراوە؛ بەرقەرار؛ ئامادە بۆ کار یان کەڵک وەرگرتن ‹ماوەیەکە ئەم شوێنە لێرە بەرپایە› ٢. هەڵدراو؛ هەستاو ‹چادرەکەی ئێمە تا بەیانی بەرپایە› ◼ ١و٢. برپا

⊡ **بەرپا بوون:** دامەزران؛ ساز بوون ‹لە ناخی جەرگی زەردەشت گومبەدی ئەفسانە بەرپا بوو/ لە جێگەی ئاگری باپیرەگەورەم بارەگای هەڵدا «قانع»› ◼ برپا شدن

**بەرپا کردن:** دامەزراندن؛ ساز کردن ‹شۆری شیعرم وا دیارە شۆڕشێک بەرپا ئەکا/ دەشتی وشکی شارەزوورم، ملکی ڕەی ڕیسوا ئەکا «قانع»› ◼ برپا کردن

**بەرپاش**[1] / berpaş/: ئاوەڵناو. پێچەوانە؛ پشتەوڕوو؛ واژی ‹وێنەی بەرپاش› ◼ وارونە

**بەرپاش**[2]: ئاوەڵکار. ١. پێچەوانە؛ پشتەوڕوو؛ واژی ‹ئالاکەیان بەرپاش گرتبوو› ٢. بەرەو دواوە؛ بەرەوپاش ‹ماشینەکە بەرپاش دەڕوا› ◼ ١. وارونە ٢. عقب ـعقب

**بەرپاڵ** / berpał/: ناو. بنار؛ قەدپاڵ؛ داوێنی کێو ‹ڕێگای کەوتە بەرپاڵێک/ کەوتبووە سەر خەیاڵێک «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ◼ دامنەی کوه

**بەرپان** / berpan/: ئاوەڵناو. بەرین؛ بە بەری زۆرەوە ◼ عریض

**بەرپرس** / berpirs/: ناو. لێپرسراو؛ بەرپرسیار؛ وەرپرس؛ لێپرس؛ سەرپەرشت ◼ مسئول

**بەرپرسایەتی** / berpirsayetî/: ناو. بەرپرسی؛ بەرپرسییەتی: ١. ئەرک؛ کار یان پیشەیێ کە پێویستی بە وەڵام دانەوەیە ٢. دۆخ یان چۆنیەتی بەرپرس بوون ◼ ١و٢. مسئولیّت

**بەرپرسی** / berpirsî/: ☜ **بەرپرسایەتی**

**بەرپرسیار** / berpirsyar/: ناو. بەرپرس ‹ئەم تەڤ ژ ڤێ بەرپرسیار/ بەسن ژ خەو ڕابن شیار «جگەرخوێن»› ◼ مسئول

**بەرپرسیەتی** / berpirsyetî/: ☜ **بەرپرسایەتی**

**بەرپرسییەتی** / berpirsîyetî/: ☜ **بەرپرسایەتی**

**بەرپەرچ** / berperç/: ناو. ١. کاری پێچ دانەوەی بزمار ٢. کاری ڕێگە لێبڕینەوە ٣. کاری قسە پێ برین ٤. زیچ؛ کاردانەوە ٥. وەڵامی ناویستەکی لەش لە هەمبەر دنەدەرێکدا ◼ ١. پَرچ ٢. قطع مسیر ٣. پاسخ ۴. واکنش ۵. واکنش غیر ارادی

⊡ **بەرپەرچ دانەوە:** بەرتەک دانەوە؛ قسە پێ برین ◼ بە نشانەی اعتراض سخن کسی را قطع کردن

**بەرپەڵ** / berpeł/: ئاوەڵناو. بەرکەوتووی کار و کردەوەیەکی زیانبار ‹دارێک میوە بگرێ، بەرپەڵە

«مەسەل»› ☰ در معرض آزار

**بەرپیوار / berpîwar/:** ☜ **بەرپێوار**

**بەرپیواری / berpîwarî/:** ☜ **بەرپێواری**

**بەرپێ[1] / berpê/:** ناو. ١. بەردەم؛ پێش ‹هەموو سەرپۆش سپی و بەرزن/ بەرپێ بەفراو، داوێن سەوزن «گۆران»› ٢. ژێرپێ ‹پێنووس کە پەسندی تۆ دەنووسێ/ بەرپێ لە ڕەشاوی دڵ دەخووسێ «سوارە»› ☰ ١. پیش‌رو ٢. زیرپا

**بەرپێ[2]:** ئاوەڵناو. پاشێل؛ پێشێل؛ پێخوست ☰ لگدمال

**بەرپێچ / berpêç/:** ناو. ١. واشەر؛ مۆرەی پێچ ٢. پێشگری ☰ ١. واشر ٢. پیشگیری

**بەرپێدراو / berpêd(i)raw/:** ئاوەڵناو. پاخۆشە؛ پێخوس؛ پێخوست؛ لە بەر پێ وردبوو ☰ لگدمال شده

**بەرپێک / berpêk/:** ناو. تفەنگاوێژ؛ تیراوێژ ☰ تیررس

**بەرپێن / berpên/:** ناو. پاشقول؛ کاری پێ وە بەر پێ‌دان ☰ لِنگ

**بەرپێوار / berpêwar/:** ئاوەڵناو. بەرپیوار؛ نادیار ☰ ناپیدا

**بەرپێواران / berpêwaran/:** ناو. پەنامان؛ نادیارییەکان ☰ ناپیداها

**بەرپێواری / berpêwarî/:** ناو. بەرپیواری؛ نادیاری ☰ نامعلومی

**بەرتا / berta/:** ناو. گەنەتا؛ سووکە تەو و لەرزی پێش نۆبەتی ☰ پیش تب

**بەرتارمە / bertar(i)me/:** ناو. بانجێلە؛ بانجیلە؛ بالکۆنی بەر پەنجەرە ☰ بالکن

**بەرتاش / bertaş/:** ناو. ١. بەردتراش؛ کوچک‌تاش؛ بەردبڕ ٢. بەرگەدەتراش؛ مووی بەر تاش ☰ ١. سنگ‌تراش ٢. موی زهارتراش

**بەرتاو / bertaw/:** ئاوەڵناو. تاوگر؛ تایبەتمەندی شوێنێ کە تاو لێی ئەدا ☰ آفتابگیر

**بەرتاوان / bertawan/:** ئاوەڵناو. تۆمەتبار؛ تاوان وەپاڵدراو ☰ مُتهم

**بەرتفک / bertifk/:** ناو. مقەنەزمە؛ گەفژاڵ؛ چەخماخی تفەنگ؛ چەکوش‌ئاسایەک لە چەکدا کە پاڵ بە دەرزییەوە دەنێ، بدا لە تەرەقە ☰ چخماق تفنگ

**بەرتڤک / bertivk/:** ناو. بەردەفڕکێ؛ بەردهاوێژی؛ کاری کوچک هاویتن ☰ سنگ‌پرانی

**بەرتل / bertil/:** ناو. گوێچ؛ پارە یان مێچ کە لە کایەدا دایدەکەن ☰ پول یا شتالنگ تیله‌بازی

**بەرتوڕ / bertuř/:** ئاوەڵناو. خوار و خێچ؛ کەچ و داهاتوو ☰ کج و کوله

**بەرتەرەف / berteref/:** ئاوەڵناو. لەبەین‌چوو؛ خەلاس‌بوو ☰ برطرف

**بەرتەسک / bertesk/:** ئاوەڵناو. تەسک؛ کەم‌بەر ‹ئاخۆ بەرتەسکە یا بەری پانە؟/ بە دەستە ئەیدەن یاخۆ بە دانە؟ «قانع»› ☰ ١ کم‌عرض

**بەرتەسکی / berteskî/:** ناو. تەنگەبەری ☰ تنگی

**بەرتەقا / berteqa/:** ئاوەڵکار. بارتەقا؛ بە قەد ☰ به قدر

**بەرتەک[1] / bertek/:** ناو. بەرپەرچ؛ زیچ؛ کاردانەوە ☰ واکنش

⊡ **بەرتەک دانەوە:** ☜ **بەرپەرچ دانەوە**

**بەرتەک[2]:** ئاوەڵناو. بەرهێرش؛ لە ژێر پەلاماردا ☰ مورد هجوم

**بەرتەلاش / bertełaş/:** ئاوەڵناو. زلحۆلی خوێنتاڵ؛ زەبەلاحی ناقۆلای خوێنتاڵ ☰ لندهور بدقواره

**بەرتەلانە / bertełane/:** ناو. بەرتێلانە؛ بەرتیلانە؛ دیاری ماڵی بووک بۆ ماڵی زاوا بەر لە گوازتنەوە ☰ هدیه‌ی خانه‌ی عروس به خانواده‌ی داماد قبل از عروسی

**بەرتەنگ:** ئاوەڵناو. ١. بێ‌دەرەتان ٢. تەنگەبەر؛

بەرتەسک ‹کۆلانی بەرتەنگ› ☰ ۱. گرفتار ۲. تنگ

**بەرتەنگی** / bertengî/: ناو. تەنگانە؛ تەنگژەیی؛ تەنگەبەری ☰ تنگنا

**بەرتەونانە** / bertewnane/: ناو. گۆرانی کاتی تەون کردن ☰ آواز هنگام فرش بافتن

**بەرتیل** / bertîl/: ناو. هبوودی؛ ڕشفەت؛ ڕشوەت؛ لێفەت؛ سمێلچەورانە؛ دەمشیرینی؛ پوولێ کە خاوەن دەسەلات بۆ جێبەجێ کردنی کارێک بە ناڕەوا دەیسێنێ ☰ رشوه

**بەرتیلخۆر** / bertîlxor/: ناوەڵناو. ڕیشوەگر ‹نە بەرتیلخۆر بە نە دۆعانووس بە/ نە نۆکەر ئاغا بۆ نانەخووس بە «قانع»› ☰ رشوه‌خوار

**بەرتێشت** / bertêşt/: ناو. بەرچایی؛ تاشت؛ قلیان قاوەڵتی؛ سووکە خواردنی پاش لە خەو هەستان ☰ ناشتایی

**بەرتێلانە** / bertêlane/: ☜ بەرتەلانە

**بەرتێڵانە** / bertêłane/: ☜ بەرتەڵانە

**بەرج** / berc/: ناو. خەرجی خۆڕایی و ناپێویست ☰ بَرج؛ خرج تحمیلی

**بەرجفت** / bercift/: ناو. داهاتی جووت و گا ☰ محصول زراعت

**بەرجل**[1] / bercil/: ناو. بەروانکەی مناڵ ☰ پیشبند بچه

**بەرجل**[2]: ناوەڵناو. بەرچاوتەنگ ☰ تنگ‌نظر

**بەرجڵانەکێ** / bercilanekê/: ناو. جۆلانێ؛ دێلەکانێ ☰ تاب

**بەرجۆم** / bercom/: ناو. ۱. جیکڵدانە؛ جیقڵدان ۲. سیکەتۆرە؛ سیقەتۆرە ☰ ۱. چینه‌دان ۲. سنگدان

**بەرجووت** / bercût/: ناو. بەربێڵ؛ بەرەبێڵ؛ بەرەجووت؛ داهاتی زەوی ☰ محصول کشاورزی

**بەرجەڤان** / bercevan/: ناوەڵناو. خاوێن؛ پاک؛ تەمیس ☰ پاکیزه

**بەرجەوەن** / bercewen/: ناو. بەرجەوەند؛ بەرژەوەن؛ بەرژەوەند: ۱. دیمەن؛ ئەوەی لە پێش چاوڕا دیارە ۲. بەراورد؛ کاری لێکدانەوە ☰ ۱. چشم‌انداز ۲. تخمین؛ برآورد

**بەرجەوەند** / bercewend/: ☜ بەرجەوەن ـ۱

**بەرجەوەندار** / bercewendar/: ناوەڵناو. خۆش‌دیمەن ☰ خوش‌منظر

**بەرجەوەنگ** / berceweng/: ناو. بەرژەوەند؛ مەسلەحەت ☰ مصلحت

⊡ **بەرجەوەنگ کردن**: چاکە و خراپە هەڵسەنگاندن ☰ سنجیدن

**بەرجی** / bercî/: ئامراز. بێجگە؛ جگە ☰ بجز

**بەرجینک** / bercînk/: ناو. بەرچیغ؛ ئەستوندەکی چیغی مەڕ و مالات ☰ دیرک چادر

**بەرجێنگ** / bercêng/: ناو. بەرچاوکە؛ بەرچاوگە؛ بەرچاویلە؛ پێشەسەر؛ خشڵێکی زێڕی ژنانە، بە سەر توێڵدا دێت ☰ نوعی زیور زنان

**بەرچا** / berça/: ناو. بەرتێشت؛ بەرچایی ☰ ناشتایی

**بەرچاڤک** / berçavik/: ناو. چاویلکە ☰ عینک

**بەرچاڤکی** / berçav(i)kî/: ناوەڵناو. عەینەکی؛ چاویلکەیی؛ چاویلکە لە چاو ☰ عینکی

**بەرچاکڵە** / berçakłe/: ناو. گرێدانێکە بە گوریس بۆ بەستنی باقەی شەغرە ☰ نوعی گره طناب برای بار کردن علوفه

**بەرچاو**[1] / berçaw/: ناو. ۱. دیمەن ۲. دیاردە ☰ ۱. منظره ۲. پدیده

**بەرچاو**[2]: ناوەڵناو. ۱. جوان و لەبار ‹لەو خەومدا هێشتا لاو بووم/ هێشتا بەنموود و بەرچاو بووم «هێمن»› ۲. چاوگر؛ بەرچاوگر؛ بەرچاوی؛ شایانی سەرنج ‹ماڵی وا بەرچاو بۆ من نابێ› ۳. دیار؛ خویا ‹کوێخا ناخوازێ کەس خاوەن ناو بێ/ هەرچێک بۆی ئەکەی ناشێ بەرچاو بێ «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ ۱. زیبا ۲. چشمگیر ۳. پیدا

**بەرچاوبرسی / berçawbirsî/**: ئاوەڵناو. تێرنەخۆرە؛ تێرنەخۆر؛ تایبەتمەندی کەسێ کە بە هیچێ تێر ناخوا ≡ حریص

**بەرچاوتاریک / berçawtarîk/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ۱. ناهومێد ۲. زۆر تووڕە و ڕکھەستاو ≡ ۱. مأیوس ۲. غضبناک

**بەرچاوتەنگ / berçawteng/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* چاوتەنگ؛ چاوچنۆک؛ چاڤچنۆک؛ چاڤینۆک؛ چنۆک؛ چەکەسوو؛ چەکھەسوو؛ هەسوو؛ چاونەزێر؛ چاوچوو؛ نەفس‌پیس؛ درژ؛ گاڤبەر؛ بەئێرەیی ≡ حسود

**بەرچاوتەنگی / berçawtengî/**: ناو. چاوتەنگی؛ چاونەزێری ≡ حسودی

**بەرچاوتێر / berçawtêr/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دڵاوا و بەخشندە ≡ بخشنده

**بەرچاوخەر / berçawxer/**: ئاوەڵناو. پیشاندەر؛ نیشاندەر ≡ نشان‌دهنده

**بەرچاوکە / berçawke/**: ناو. ۱. بەرچاوە؛ قایشی ڕیشووداری بەرچاوی ئەسپ ۲. ☜ بەرجێتگ ≡ ۱. پیشانی بند اسب ۲. ☜ بەرجێتگ

**بەرچاوگر / berçawgir/**: ☜ بەرچاو-۲

**بەرچاوگە / berçawge/**: ☜ بەرجێتگ

**بەرچاوە / berçawe/**: ناو. ۱. ☜ بەرچاوکە ۲. ئەفتاوگەردان ≡ ۱. ☜ بەرچاوکە ۲. پیشانی‌بند دروگران

**بەرچاوی / berçawî/**: ☜ بەرچاو[۲]-۲

**بەرچاویلە / berçawîle/**: ☜ بەرجێتگ

**بەرچاوێری / berçawêrî/**: ئاوەڵناو. ژێرچەم؛ بەرچاو ≡ زیرنظر؛ تحت مُراقبت

**بەرچایی / berçayî/**: ناو. بەرتێشت؛ بەرقلیان؛ بەرقەننە ≡ ناشتایی

**بەرچن / berçin/**: ناو. بەرچنە؛ تریان؛ قەرتاڵەی میوەچنی ≡ سبد میوەچینی

**بەرچنۆک / berçinok/**: ☜ بەرچنۆکە

**بەرچنۆکە / berç(i)noke/**: ناو. بەرچنۆک؛ بەرچنی چکۆلە ≡ سبدک میوەچینی

**بەرچنە / berç(i)ne/**: ☜ بەرچن

**بەرچۆ / berço/**: ناو. کاری دژوار کە بە هەر کەسێ نەکرێ ≡ کار طاقت‌فرسا

**بەرچۆک / berçok/**: ناو. بەلەک؛ قولەپێ؛ ساقەتەی پا ≡ ساق پا

⊡ **بەرچۆک نان**: داگیر کردن؛ دەست بە سەردا گرتن ≡ غصب کردن

**بەرچۆڵەمە / berçołeme/**: ناو. بەرچێلەگە؛ بەرچێلەی گا؛ پێستی نەرمی شۆڕەوە بووی ژێر ملی گا ≡ پوست نرم و آویزان زیر گردن گاو

**بەرچەپ[۱] / berçep/**: ناو. مێمل ≡ آفت

**بەرچەپ[۲]**: ئاوەڵناو. دژ ≡ ضد

**بەرچەپ[۳]**: ئامراز. پێچەوانەی ≡ برخلافِ

**بەرچەق / berçeq/**: ناو. ۱. سەرچۆپی‌کێش؛ پێشەنگی گۆبەند ۲. مشتووک؛ دەستە خەنجێر و شمشێر ≡ ۱. پیشاهنگ رقص جمعی ۲. دستەی خنجر و شمشیر

**بەرچەلینک / berçelînk/**: ناو. بۆتەی زێڕینگەران ≡ بوتەی زرگران

**بەرچەڵە / berçeɫe/**: ناو. ئەستوندەکی دەرەوەی چادر لە لای چیغەوە ≡ ستون خارجی خیمە

**بەرچەنە / berçene/**: ناو. ۱. کرمەک؛ خشڵێکە بە بەر چەنەگەدا دێ و لە دوو لا لە سەر دەدرێ ۲. بەرخەبەبە؛ بەرچێلە ≡ ۱. زیور زیر چانە ۲. غبغب

**بەرچیت / berçît/**: ناو. ۱. بەرچیخ؛ بەرچیغ؛ خوترە؛ خوترەک؛ خوتەک؛ سنگی چیغڕاگر ۲. پەردەی جیاکەرەوەی نیشتنگەی پیاوان لە ژنان لە ناو ڕەشماڵدا ۳. پەیاغ؛ گالۆک؛ کوتەک ≡ ۱. میخ چوبین سیاه چادر ۲. پردەی حایل زن و مرد در سیاه چادر ۳. چُماق

**بەرچیچک / berçîçik**: ناو. نزگەرە؛ نزێرە ■ سکسکە

**بەرچیخ / berçîx**: ☜ بەرچیت ـ١

**بەرچیغ / berçîğ**: ☜ بەرچیت ـ١

**بەرچیلک / berçîlik**: ناو. جیکلدان؛ بەرچینەک ■ چینەدان

**بەرچیلە / berçîle**: ناو. خرخرە؛ بەرخەبەبە ■ غبغب

**بەرچین / berçîn**: ناو. بەربوورە؛ کاری تۆو وەشاندن پێش کێلان ■ تخم‌پاشی پیش از شخم

**بەرچینە / berçîne**: ناو. بەرچن؛ تریان ■ سبد میوەچینی

**بەرچینەک / berçînek**: ☜ بەرچیلك

**بەرچێڵە / berçêle**: ناو. بەرخەبەبە؛ گۆشتی ژێرچەنە ‹وا ماتی خەیاڵ و دوورەئاگان/ بەرچێڵە ونی دەکا چەناگان! «هەژار، *مەم و زین*»› ■ غبغب

**بەرچێڵەگە / berçêlege**: ☜ بەرچۆڵەمە

**بەرچێن / berçên**: ناو. کاری چاندنی پێش کێلان ■ بذرپاشی قبل از شخم

**بەرحەق / berĥeq**: ئاوەڵناو. حەق‌بەدەست ■ برحق

**بەرحەلینگ / berĥelîng**: ناو. بۆتەی بەردین؛ دەفری تاواندنەوەی کانزا ■ بوته

**بەرخ / berx**: ناو. ١. بەرا؛ وەر؛ وەرە؛ وەرخ؛ بێچووی پەز ‹بەرخی نێر بۆ سەربرینە «مەسەل»› ٢. */کینایە/* ڕۆڵەی جوانی خنجیلانەی خۆشەویست ‹مەگری بەرخم! ئارام بگرە کوڕێژگەکەم! «پەشێو»› ٣. */کینایە/* کیژ یان ژنی جوان و لەبەردڵان ‹هاوار بە ماڵم بەرخە پاییز زێ!/ ئەگەر تۆ بار کەی من ڕوو کەم لە کوێ؟ «فولکلۆر»› ■ ١. برّه ٢. جگرگوشه ٣. دختر یا زن دلربا

**بەرخنکێنە / berxxinkêne**: ناو. گیایێکی نووسەکە لە مێرگدا دەڕوێ ■ نوعی گیاه چسبناک مرغزار

**بەرخستوو / berxistû**: ئاوەڵناو. بەراویتە ■ سقط‌کرده

**بەرخڤان / berxvan**: ناو. شوانی بەرخان ■ برّه‌چران

**بەرخوار / berxwar**: ناو. ١. بەرخۆر؛ ئەو ئازووقەی بەر لە زستان دە کار دەکرێ ٢. قوماش یان جلکی ڕاست نەبڕاو ■ ١. آذوقەی پیش‌خور ٢. برش کج لباس یا پارچه

**بەرخوردار / berxurdar**: ئاوەڵناو. مرادحاسڵ؛ کامڕەوا ■ برخوردار

**بەرخورک / berxurk**: ناو. تەرزەی ورد؛ تەیرۆکێد هوور ■ تگرگ ریز

**بەرخوەدان / berxiwedan**: ☜ بەرخۆدان

**بەرخوێن / berxwên**: ناو. دابێکی خوێنبایی سەندنە، مرۆکوژ دەبێ کچ یان خوشکی لە تۆڵەی کوشتنەکەیدا بدا بە ماڵە کوژراو. هەروەها: **بەرخوێنی** ■ رسم دادن دختر به عنوان خونبها

**بەرخۆدان**[1] **/ berxodan**: چاوگ. بەرخوەدان: ١. خۆ بەخت کردن ٢. بەرگری کردن ■ ١. فداکاری کردن ٢. دفاع کردن

**بەرخۆدان**[2]: ناو. بەرخوەدان: ١. گیانبازی ٢. بەرگری ■ ١. فداکاری ٢. دفاع

**بەرخۆر**[1] **/ berxor**: ناو. پێشخۆر؛ خواردنێکی سووک، پێش خۆراکی سەرەکی ■ پیش‌غذا

**بەرخۆر**[2]: ئاوەڵناو. ١. */مەجاز/* بەردکرۆژ؛ خۆهەڵکێش و بافیش‌کەر ٢. زگ‌لەوەڕێن؛ خۆ بە خەڵک تێرکەر ■ ١. خودستا ٢. مُرده‌خور؛ سورچَر

**بەرخۆڵە / berxołe**: ناو. ١. بەرخەساوا ٢. */کینایە/* منداڵی خنجیلانە و جوان ٣. */کینایە/* کیژۆڵەی لەبەردڵان ■ ١. برّەی نوزاد ٢. کودک زیبا ٣. دخترک دلربا

**بەرخەبەبە / berxebebe**: ناو. بەرچێڵە؛ غەبغەبە

غبغب

**بەرخەساوا** / berxesawa/: ناو. بەرخۆڵە؛ وەرکۆرپە؛ وەرکۆرپە؛ کافڕ برەی نوزاد

**بەرخەفج** / berxefic/: ناو. مۆتە؛ مۆتەکە؛ شەوە کابوس

**بەرخەل** / berxel/: ☜ بەرغەل

**بەرخەلەوان** / berxelewan/: ☜ بەرغەلەوان

**بەرخەلان** / berxełan/: ناو. کۆزی بەرخ؛ تامانی جێ بەرخ و کاژیلە محل نگهداری برّه و بُزغالە در کوه

**بەرخەوان** / berxewan/: ☜ بەرغەلەوان

**بەرد**[1] / berd/: ناو. بەر؛ کوچک؛ کوچگ؛ سەنگ؛ سان؛ تەوەن؛ تەڤەنی؛ تونی؛ کەڤر؛ کەمور؛ کەرا؛ کارا؛ تەنی تۆکمە و پتەوی سروشتی کە لە خاک یان کانەگەلی جۆراوجۆر پێکهاتووە سنگ

▣ **بەردی نیشان**: ١. ئەو بەردە بۆ نیشان کردن دادەنرێ ٢. *[مەجاز]* خۆڕاگر؛ بەرگەگر ١. سنگ نشانە ٢. مقاوم

▣ **بەرد بە با کردن**: *[مەجاز]* زۆر توورە بوون ‹وای ڕق هەستابوو، بەردی بە با دەکرد!› بسیار عصبانی شدن

**بەرد لە سەر دانان**: *[مەجاز]* شاردنەوەی ڕاز و نهێنی ‹ئەم قسەیە هەر لێرە بەردێکی لە سەر دادەنێین و ببرێتەوە› نهان کردن راز

**بەرد لە سەر مەلۆ دانان**: *[مەجاز]* خاترجەم بوون؛ دڵنیا بوون ‹تازە بەردی لە سەر مەلۆ داناوە، خەمی هیچی نییە!› خاطرجمع شدن

**بەرد**[2]: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ڕەق؛ زوها؛ سەخت؛ زەب؛ سان ‹بەزەیی کوا لە دڵی بەردیدا؟/ شومری پێ ناگا لە نامەردیدا «هێمن»› سخت؛ سنگ

**بەردئاش** / berd'aş/: ☜ بەرداش

**بەردا** / berda/: ئاوەڵکار. پێشوو؛ لە پێشدا سابقاً

**بەردار** / berdar/: ئاوەڵناو. ١. بەبەر؛ خاوەن داهات ٢. هەڵگر و بە سەبر ٣. ڕابەردار؛ ڕجوا؛ گونجاو لەگەڵ قانوون و داب و نەریتدا ‹لە بەر داری حەدا من بم، ئەتۆ مەست!/ دە قازی حەق بڵێ تۆ! حەق چ بەردار؟ «مەحوی»› ١. مُثمر ٢. شکیبا ٣. روا

**بەرداسی** / berdasî/: ئاوەڵناو. باری دەغڵێک کە کاتی دروێنەی هاتبێ آمادەی درو (محصول)

**بەرداش** / berdaş/: ناو. بەردئاش؛ بەردی ئاش؛ سەنگ ئاسیاو ‹بەرداشی خلێنە و ددانان/ لیکی دەم و چەقچەقی زمانان «هەژار، *مەم و زین*»› سنگ آسیاب

**بەرداشت** / berdaşt/: ناو. ١. بەهرەی زەوی ٢. ڕەوتی بۆچوون؛ تێگەیوی ٣. دیباچە؛ سەرەتای کتێب ١. بهرەی زمین ٢. نتیجەگیری ٣. دیباچەی کتاب

**بەردامێن** / berdamên/: ناو. بەردانک؛ بنار کوهپایە

**بەردانک** / berdank/: ناو. بەردامێن؛ بنار دامنە

**بەردانگ** / berdang/: ناو. ژێروو؛ لای خوارەوە طرف پایین

**بەردانی** / berdanî/: ناو. ڕەقەن؛ بەردەلان سنگلاخ

**بەرداوبەرد** / berdawberd/: ☜ بەردەلبەرد

▣ **بەرداوبەرد کردن**: ١. دانەمرکان لە ماڵا و ئاوارەی چیا بوون ٢. *[کینایە]* زۆر گەڕان ١. آرام نگرفتن و آوارە شدن ٢. بسیار سفر کردن

**بەرداوەتی** / berdawetî/: ناو. گۆرانی داوەت آواز عروسی

**بەرداوی** / berdawî/: ناو. بەردەلان سنگلاخ

**بەرداوێژ** / berdawêj/: ناو. بەردهاوێژ: ١. کەسێک کوچک پەرت ئەکا ٢. مەودای بەرد گەیشتن بە هاوێشتن ١. سنگ‌پران ٢. بُرد پرتاب سنگ

**بەرداوێن** / berdawên/: ناو. تەشک دامان

**بەرداین / berdayn/**: ناو. چاودێری؛ چاوەدێری ☰ نظارت

**بەردایی / berdayî/**: ئاوەڵناو. بەرەڵدا؛ ئازاد؛ بەرهەڵداکراو ☰ رها؛ وِل

**بەردباران / berdbaran/**: ☜ بەردەباران

**بەردبڕ / berdbiř/**: ناو. بەربڕ؛ کوچکبڕ ☰ سنگبُر

**بەردتاش / berdtaş/**: ناو. کوچکتراش ☰ سنگتراش

**بەردتراش / berdt(i)raş/**: ☜ بەرتاش ـ١

**بەردراو / berd(i)raw/**: ئاوەڵناو. بەردریاگ؛ ئازادکراو ☰ آزاد شده؛ رهاشده

**بەردرگا / berdirga/**: ناو. دەرماڵ ☰ جلو در

**بەردرگانە / berdirgane/**: ناو. دەروبان؛ دەرکوبان؛ دەرودوو ☰ پیرامون خانه

**بەردریاگ / berdiryag/**: ☜ بەردراو

**بەردڕانە / berd(i)řane/**: ناو. بەردڕکانە؛ بەردڕەکانە؛ نوقڵانەی بەرگی تازە؛ شیرنی جلکی نوێ ☰ انعام لباس تازه

**بەردڕکانە / berdiřkane/**: ☜ بەردڕانە

**بەردڕەکانە / berd(i)řekane/**: ☜ بەردڕانە

**بەردکار / berdkar/**: ☜ سەنگکار

**بەردکاری / berdkarî/**: ناو. کاری بەرد کردن؛ بەرد دە کار کردن ☰ سنگکاری

**بەردکرۆژ / berdk(i)roj/**: ☜ بەرخۆر[2]ـ١

**بەردکێش / berdkêş/**: ناو. ١. کوچککێش؛ ئەوەی کاری گواستنەوەی پارچەبەردە ٢. شەلتە؛ بارێکی دووتای دارینە بەرد و گڵی پێ‌دەکێشن ☰ ١. سنگکش ٢. وسیلەی سنگکشی

**بەردگێڕە / berdgêře/**: ناو. مەلێکە لە تۆرەمەی ڕەوڕەوە، ٢٢ سانتیمیترە، بە باڵ و پەڕی ڕەنگامە، لاقی کورت و نارنجی، دندووکی ڕەش و قوڵ و تیژەوە، لە کاتی چینەدا بۆ دۆزینی خۆراک بەرد و گوێماسیلکە هەڵگێڕ وەرگێڕ دەکا و لە خیزەلان و قەراخ دەریا دەبیندرێت ☰ سنگگردان

**بەردلک[1] / berdilk/**: ناو. ١. بەروانکە؛ ئەو پۆشەنە بەری جلوبەرگ دادەپۆشێ، کاتی کار کردن پیس نەبن ٢. شاماکی؛ سینەبەرە؛ جۆرێ ژێرپۆشی ژنانە بۆ بەرگری لە داهێزانی مەمکان ☰ ١. پیشبند ٢. سینەبند

**بەردلک[2]**: ئاوەڵناو. خۆشەویست ☰ دوستداشتنی

**بەردڵ[1] / berdił/**: ناو. بەرچایی؛ وەردڵ؛ تاش؛ قلیان قاوەڵتی؛ بەرتێشت ☰ ناشتایی

⊡ **بەردڵ خستن**: تۆزێ نان خواردن ☰ تەبندی کردن

**بەردڵ[2]**: ئاوەڵناو. وەردڵ؛ خۆشەویست؛ لەبەردڵان ☰ محبوب

⊡ **هاتنە/ کەوتنە بەردڵ**: خۆشەویست بوون ‹پیاوی گەورەمان نایەتە بەردڵ/ تاکوو ئەو ڕۆژەی نەچێتە ژێر گڵ «موفتی پێنجوێنی»› ☰ رفع گرسنگی کردن

**بەردم / berdim/**: ☜ بەردەم

**بەردۆ / berdo/**: ناو. ١. گادۆشکە؛ مەرکەنی؛ سەتڵی گەورەی مانگا دۆشین ٢. پرژانی شیر کاتی دۆشین، بۆ دەرەوەی مەڕدۆش ☰ ١. سطل بزرگ ٢. پاشیدن شیر هنگام دوشیدن به خارج ظرف

**بەردۆش / berdos/**: ناو. ١. کار و ڕەوتی تەکان دان ٢. بەرهەڵبێنە ☰ ١. تکان ٢. پیشبند

**بەردۆڵیان / berdołyan/**: ☜ ناردلوێژـ١

**بەردو / berdû/**: ناو. بەردووگ؛ بن دووگی مەڕ ☰ زیر دنبەی گوسفند

**بەردوخ / berdûx/**: ناو. ١. ئامرازێکە لە دووخی خەرەکدا ‹سەر: خەرەک، بەردووخ: موو، ناخوون دەلالە، گوێ: سپەر! «سالم»› ٢. بەردەچکۆلەیەکە دەخرێتە سەر پێچکەی خەرەک ‹لە ڕووی ئەودا منارەی شاری هەولێر/ بە قەد بەردووخە جورمی،

بەڵــکه کــمترا «ســالم»» 🇮🇷 ١. ابــزاری در دوک نخریسی ٢. ریگی که روی حلزون نخریسی می‌گذارند

**بەردووگ / berdûg**/: ناو. بەردوو؛ بنی دووگی مەڕ 🇮🇷 بُن دنبه‌ی گوسفند

**بەردوولاڤێ / berdûlavê**/: ناو. هەوا و بەستەییکە ژنان لە بەر خۆیانەوە کاتی خوری ڕستن و ڕایەخ چێ‌کردن دەیخوێنن 🇮🇷 آهنگی که زنان هنگام دوک‌ریسی خوانند

**بەردووڵە / berdûle**/: ناو. ١. تەشتی گڵین بۆ نان تێنان ٢. دەفری چڵکاوی ئاسنگەر و پینەچی 🇮🇷 ١. تشت سفالین ٢. ظرف آب آهنگر و پینه‌دوز

**بەردوویک / berdûwîk**/: ناو. سنگ و مەمک 🇮🇷 سینه و پستان

**بەردە[1] / berde**/: ناو. ١. بەنی؛ خولامی زێرکڕی ٢. هەناردە؛ ئەو داهاتە بۆ دەرەوە دەنێردرێ بۆ فرۆشتن 🇮🇷 ١. برده ٢. صادرات

- **بەردە[2]**: پاشەوشە. ـــ بردوو؛ ـ بردگ ‹سەڵوی بادبەردە! سەڵوی بادبەردە!/ میحنەت‌زەدەی دەرد! سەڵوی بادبەردە! «سەیدی»› 🇮🇷 ـ بُرده

**بەردە[3]**: پێرۆ. ← **بگرەبەردە**

**بەردەئازەبە / berde'azebe**/: ناو. بەردەعازەبە: ١. بەردێ کە لاوان لەسەر زۆرتر ڕاگرتنی، پێکەوە کێبەرکێ دەکەن ٢. *[مەجاز]* کەسێک کە دەبێتە هۆی ئازار و خەمی خەڵک 🇮🇷 ١. سنگ زورآزمایی ٢. مایه‌ی زحمت

**بەردەئەستێ / berde'estê**/: ناو. بەردەستێ؛ بەردی ئاگرپژێن 🇮🇷 سنگ آتشزنه

**بەردەئەموستیلە / berde'emustîle**/: ناو. نقیم؛ مۆرخوانە 🇮🇷 نگین انگشتر

**بەردەبار / berdebar**/: ناوەڵناو. زانا و بە تەگبیر. هەروەها: **بەردەباری** 🇮🇷 مُدبِّر

**بەردەباران / berdebaran**/: ناو. بەردباران؛ کوچک‌واران 🇮🇷 سنگباران

**بەردەباز / berdebaz**/: ناو. بەردەواز؛ پردەباز؛ ڕێزە بەردی دانراو لە ناو چۆمدا کە بە سەریا ئەپەڕنەوە ‹دڵم ناوێ نەبێ قوربانی نازی/ سەرم ناوێ نەبێتە بەردەبازی «هێمن»› 🇮🇷 سنگ‌های گدار

**بەردەبەڵک / berdebelk**/: ناو. بەردەجەرگە؛ جۆرێ بەردی سوور و لووس، لە جەرگ دەکا 🇮🇷 سنگی شبیه جگر

**بەردەبیرۆ / berdebîro**/: ناو. بەردێکە بۆ ڕەقی و سەختی نموونەیە 🇮🇷 سنگی بسیار سخت

**بەردەبێر / berdebêr**/: ناو. بەردێ کە شوان لە سەری دەنیشێ و مێ دەگرێ بیدۆشن 🇮🇷 سنگی که چوپان بر آن نشیند و گوسفند را می گیرد که بدوشند

**بەردەبێڵ / berdebêl**/: ناوەڵناو. سێ ساڵان (مەڕ) 🇮🇷 سه ساله (گوسفند)

**بەردەپا / berdepa**/: ☜ بەردەپێ

**بەردەپاشۆر / berdepaşor**/: ناو. پێ‌شۆر 🇮🇷 سنگ پا

**بەردەپێ / berdepê**/: ناو. بەردەپا؛ سەنگی پا؛ بەردێکی ڕەشی کرووزە، لە گەرماو بەری پێی پێ دەشۆن 🇮🇷 سنگ‌پا

**بەردەتات / berdetat**/: ناو. بەردەنوێژ؛ کوچک‌نوێژ؛ بەردەنما؛ بەردی پان و لووس لە ڕەخی کانی و ئاو بۆ نوێژ و دانیشتن 🇮🇷 سنگ تخت ویژه‌ی نماز خواندن

**بەردەتراوکە/ berdet(i)rawke**/: ☜ بەردەتراویلکە

**بەردەتراویلکە / berdet(i)rawîlke**/: ناو. تراویلکە؛ بەردەتراوکە؛ بەردەترۆق؛ بەردەڕێژگە؛ زیخە شینکە کە لە بەر تاو ئەترووسکێ و وەک ئاو دیار دەکا 🇮🇷 سراب

**بەردەترۆق / berdet(i)roq**/: ☜ بەردەتراویلکە

**بەردەتووتن / berdetûtin**/: ناو. بەشێکی تووتنانە بۆ ئاغا 🇮🇷 سهمیه‌ی توتون ارباب

**بەردەجەرگە** / berdecerge/: ☜ **بەردەبەلك**

**بەردەچەخماخ** / berdeçexmax/: ناو. سەنگی چەخماخ؛ بەردەچەرخ ☰ سنگ چخماق

**بەردەچەرخ** / berdeçerx/: ☜ **بەردەچەخماخ**

**بەردەخوێ** / bedex(i)wê/: ناو. ١. بەردێکی پان، خوێی پێدا دەکەن بۆ ئاژەڵ ٢. خوالێن؛ کەفڵە؛ کانەی کلوریدی سدیوم کە بێخەوشەکەی ڕوون و بێڕەنگە ☰ ١. سنگ نمک‌لیس حیوانات ٢. سنگ نمک

**بەردەرانە** / berderane/: ناو. ناقدەر ☰ ضلع پایین چهارچوب در

**بەردەرک** / berderk/: ☜ **بەردەرکە**

**بەردەرکانە** / berderkane/: ناو. پارەیێک کە لە زاوا وەردەگیرێ تا درگای ماڵی بووکی لێ بکەنەوە ☰ پولی کە از داماد می‌گیرند تا درِ خانەی عروس را بە رویش بگشایند

**بەردەرکە** / berderke/: ناو. پێش دەرک؛ پێش درگا؛ بەردەرک ☰ جلو در

**بەردەرگا** / berderga/: ناو. ١. ئاسانە؛ پێش‌ماڵ؛ بەردەرک ٢. خەلاتێکی زاوا بۆ بووک کە ئەیەوێ پەردە و دەرگای لێبکرێتەوە ☰ ١. آستانە ٢. هدیەی داماد بە عروس

**بەردەرگانە** / berdergane/: ناو. ئاسانە؛ بەر دەرگا ‹وەسیلەی گەینە شارت کێیە بێخود؟/ کە چەشنی حەلقە، بەردەرگانە دەگری «بێخود»› ☰ آستانەی در

**بەردەڕەوا** / berdeřewa/: ناو. بەردباران؛ بەردەباران ☰ سنگسار

**بەردەڕێژ** / berdeřêj/: ناو. سەنگ‌فەرش ‹بەردەڕێژ جوانیش بێ، قەت ـ قەت هاوسەری گەوهەر نییە/ پارە و ملک و مەعاش و خەزنە وەک جەوهەر نییە «قانع»› ☰ سنگفرش

**بەردەڕێژگە** / berdeřêjge/: ☜ **بەردەتراویلکە**

**بەردەزوورک** / berdezûrik/: ☜ **بەردەزوورە**

**بەردەزوورە** / berdezûre/: ناو. بەردەزوورک؛ بەردێکی زبرە ئاوی پێدا دەکەن و چەقۆی پێ تیژ دەکەن ☰ سنگ سوهان

**بەردەس** / berdes/: ☜ **بەردەست**

**بەردەسان** / berdesan/: ناو. بەردەساو؛ هەسان؛ سان؛ بەردێکی لووس‌کراوە تنۆکێ ڕۆنی پێدا دەتکێنن و تیخی پێ تیژ دەکەن ☰ فسان

**بەردەساو** / berdesaw/: ☜ **بەردەسان**

**بەردەست**[1] / berdest/: ناو. بەردەس: ١. کەسێ لە بەر دەستایە و خزمەتی کەسێک دەکا ‹چەند خۆشە ژیانی وا، چ ئازادە بە دڵ/ بۆ خۆی بێ، نە ئاغا بێ، نە بەردەستی کەسێ «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ٢. پارچەی ئاسەڕی قۆڵ لە نزیک جومگەوە ☰ ١. پادو؛ وردست؛ دستیار ٢. آستر آستین

**بەردەست**[2]: ئاوەڵناو. بەردەس: ١. لەبار یا لە بەر چاو گیراو بۆ کەڵک وەرگرتن و هێنانە کاری خێرا ‹ئامرازی بەردەست› ٢. لە بەردەستدا؛ وا کە دەستی پێ بگا ٣. ژێر دەست ‹لە کوردستانی بەردەستی تورکان هەڵلایە!› ٤. دیل؛ ئەسیر ☰ ١. دم‌دست ٢. در دسترس ٣. زیر سُلطه ۴. اسیر

**بەردەستک** / berdestik/: ناو. دەستە کەوشە؛ جێگای دەست پێوە گرتن لە سەر باسکێش لە دار و گاوەسندا ☰ دستگیرەی خیش

**بەردەستە**[1] / berdeste/: ناو. ئاسەڕی قۆڵ ☰ آستر آستین

**بەردەستە**[2]: ئاوەڵناو. گیرۆدە و یەخسیر؛ ژێردەستە ☰ گرفتار؛ اسیر

**بەردەستی** / berdestî/: ناو. ١. خزمەتەکاری؛ نۆکەری ٢. گیرۆدەیی ☰ ١. نوکری ٢. اسارت

**بەردەستێ** / berdestê/: ☜ **بەردەنەستێ**

**بەردەسماتە** / berdes(i)mate/: ناو. هەسان ☰ فسان

**بەردەسماڵ** / berdesmał/: ناو. خشڵێکە ژنان لە

دەسمالی دەدەن بە بەر ملیاندا 🇮🇷 زیوری زنانه

**بەردەشۆر** / berdeşor/: ناو. ڕێخشۆر؛ بەرەشۆ؛ بەرەشۆر؛ نیسکەوشۆر؛ کاری شوتنەوەی دەغڵ بۆ بەرد لێجیا کردنەوە 🇮🇷 شستشوی غله برای جدا کردن سنگریزه از آن

**بەردەعازەبە** / berde'azebe/: ☜ **بەردەئازەبە**

**بەردەفڕکێ** / berdefiřkê/: ناو. پەڵەفڕکێ؛ کاری بەرد هاویشتن 🇮🇷 سنگ‌پرانی

**بەردەڤ** / berdev/: ☜ **بەردەڤك**

**بەردەڤك** / berdevk/: ناو. بەردەڤ؛ بەردەوک: ۱. نۆکەری هاوڕێی سەفەر و بەردەست ۲. وێژەر لە باتی ئاغا ۳. هاودەم؛ خەمڕەوێن ٤. دەمنە؛ دەمنەسگار 🇮🇷 ۱. نوکر همسفر ارباب ۲. سخنگوی ارباب ۳. همدم ۴. چوب سیگار

**بەردەڤکی** / berdevkî/: ناو. قلیاندار 🇮🇷 قلیاندار

**بەردەقانی** / berdeqanî/: ناو. قۆچەقانی؛ کەهنیک؛ تیر و کەوان 🇮🇷 تیرکمان

**بەردەق . بەردەق** / berdeq berdeq/: ناو. کاری بیر هێنان و بردن و خەیاڵ کردنی زۆر 🇮🇷 فکر و خیال بیش از حد

**بەردەقسڵ** / berdeq(i)s(i)ł/: ناو. بەردی ئاهەک 🇮🇷 سنگ آهک

**بەردەقی** / berdeqî/: ناو. شەڕەشان؛ کێبەرکێ لە شان لێکتر دان 🇮🇷 مسابقەی تنەزنی

**بەردەکەچەڵە** / berdekeçełe/: ناو. بەردێ کە کرێژەی بەرداوە 🇮🇷 گلسنگ

**بەردەگونجە** / berdegunce/: ناو. بەردێکی کونە دەیکەنە گونجەی حەوز و ئەستێرەوە 🇮🇷 سنگ آبرفت

**بەردەگۆنجە** / berdegonce/: ناو. بەربەن؛ دار یا بەردێ کە گۆنجەی ئەستێلی پێ دەگرن 🇮🇷 دهانه‌گیر استخر

**بەردەگێچ** / berdegêç/: ناو. گەچ؛ گێچ؛ گیچ؛ سولفاتی کەلیسیومی ئاودار 🇮🇷 گچ

**بەردەلینگ** / berdelîng/: ناو. تیزماڵکە قوماشێ کە بە دەوری دەلینگی دەرپێ و پاتۆڵدا دەیدروون تا شی نەبێتەوە 🇮🇷 آستر نواری دور دمپای شلوار

**بەردەلا** / berdeła/: ناو‌ەڵناو. کەلەلا؛ زەلیل؛ لە جێدا کەوتوو 🇮🇷 زمینگیر

**بەردەلان** / berdełan/: ناو/ ناوەڵناو. بەردانی؛ بەرداوی؛ ڕێخەلان؛ ڕێخناخ؛ زاخان؛ زبران؛ شاوان؛ شەهوان؛ شکار؛ تم‌تمان؛ تم ـتم؛ تم‌تمەن؛ تەتومن؛ ڕەقانە؛ ڕەقەن؛ چەقەن؛ زورن؛ زوورک؛ کەمەرن؛ کەڤرە؛ کەڤری؛ کەڤرۆک؛ کەڕڕە؛ گەرـگەر؛ گێرـگێر؛ گیر؛ ورە؛ ڕاخ؛ ڕاغ؛ زاخان؛ بەرد بەردکوو؛ سیتک؛ سێتەک؛ تەقتەق؛ قۆمز؛ (زەوینی) داپۆشراو لە بەردی گەورە و بچووک ‹قەمچیمان وەشان سەرەوژوور دیسان/ شەق، ناڵ بوو ئەیدا لە ڕێی بەردەلان «گۆران»› 🇮🇷 (زمین) سنگلاخ

**بەردەڵبەرد** / berdełberd/: ناو. بەرداوبەرد؛ ئاوارەیی؛ دەربەدەری ‹تا کەی تەقالا تا کەی بەردەڵبەرد؟/ تا کەی بکیشم وە دڵ ئاه سەرد «شامی»› 🇮🇷 آوارگی

**بەردەم** / berdem/: ناو. بەردم: ۱. پێش ‹بەردەممان دەشتی سەوزی شارەزوور/ شاخ گرتوویە لێی دەوراندەوری دوور «گۆران»› ۲. دەمامک؛ دەم‌هەڵپێچ ۳. بەردەنگ؛ کەسی ڕووبەڕوو کە گوێگر، بیسەر یان هەستپێکەری گوتە یان پەیامێک بێ 🇮🇷 ۱. پیش‌رو ۲. نقاب ۳. مُخاطب

**بەردەمۆر** / berdemor/: ناو. مۆری جێ ئەنی شیعە لە سوژدەدا 🇮🇷 مُهر نماز

**بەردەموورو** / berdemûrû/: ناو. بەرد یان ئاسنێکی قوڵە لە ژێرەوەی بەرداش، تەوەرەی لە سەر دەگەڕێ 🇮🇷 سنگ مهرەی آسیاب آبی

**بەردەموورەسەن** / berdemûresen/: ناو. بەردێکی

خڕی سەختە لە ئاشی ئاویدا بەرداش لە سەری دەخولێتەوە ﷼ سنگی گرد و سخت در آسیاب آبی

**بەردەموکانە / berdemûkane/**: ناو. بەردەمووکە؛ دەمووکانە؛ مێوژۆکە؛ بەری جۆرە دەوەنێکە، با دەیبا بە دار مازووەوە بنووسێت، دەڕوێتەوە و کوانئاسایی دەماسێ، دەیبڕن، دەیکولێنن، نووسەکێکی زۆر لە چرێش نووسەکتری لێ پەیدا دەبێ ﷼ مویزک

**بەردەموکە / berdemûke/**: ☜ بەردەموکانە

**بەردەنگ / berdeng/**: ناو. بەردەمی قسە؛ کەسی بەرانبەر لە ئاخافتندا ‹ئەو هەمووە قسە دەکا و دەنووسێ، هیچ بەردەنگێکی نییە!› ﷼ مُخاطب

**بەردەنما / berden(i) ma/**: ☜ بەردەتات

**بەردەنوێژ / berden(i)wêj/**: ☜ بەردەتات

**بەردەنوس / berdenûs/**: ناو. ١. لەوحی بەردین ٢. نووسراوەی سەر بەرد ﷼ ١. کتیبه ٢. سنگنوشته

**بەردەواز / berdewaz/**: ☜ بەردەباز

**بەردەوام[1] / berdewam/**: ناوەڵناو. بەرقەرار ﷼ برقرار

**بەردەوام[2]**: ناوەڵکار. بێپسانەوە؛ لەسەریەک ‹بەردەوام من زەمان ئەئاژوێم/ ئەدوێم و نالیش هەر گوێ ئەگرێ لە هۆرەم «شێرکۆ»› ﷼ پیوسته

**بەردەوامی / berdewamî/**: ناو. پایەداری؛ راوەستاوی ﷼ پایداری

**بەردەوان / berdewan/**: ناو. ١. ڕازموان؛ شاخەوان؛ زەردەوان؛ کەسێ کە باش بە شاخدا هەڵدەگەڕێ ٢. مەلێکە لە تۆرەمەی قولتە بە باڵی سوور و شاباڵی ڕەشەوە کە خاڵی سپی لە سەرە، پشتی بۆر، کلکی کورت، دندووکی درێژ و خوار و باریکە کە وەک پەپوولە هەڵدەفڕێ، جەستەی ١٦ سانتیمیترە و زستانان لە دۆڵ و بناران ڕایدەبوێرێ ﷼ ١. سنگنورد ٢. دیوارخزک

**بەردەوک / berdewik/**: ☜ بەردەقك

**بەردەهاڕ / berdehař/**: ناو. بەرداش ﷼ سنگ آسیا

**بەردەی / berdey/**: چاوگ. بردن ‹ڕۆح چەنی ئەو تا جابەجا بەردم/ سەد نفرین وە تەخت شایی شا کەردم «بێسارانی»› ﷼ بُردن

**بەردهاوێژ / berdhawêj/**: ☜ بەرداوێژ

**بەردهاوێژی / berdhawêjî/**: ☜ بەرتقك

**بەردهەڵکەن / berdhełken/**: ناو. کرێکاری کانە بەرد ﷼ کارگر معدن سنگ

**بەردیل / berdîl/**: ناو. ١. کاری پێکگۆڕینەوە ٢. بەندیل؛ بەندیر؛ بەرندێر؛ شەکی بەربەران؛ مەڕی پێ لە سێ ساڵان ناو ﷼ ١. معاوضه ٢. شیشک سه ساله

**بەردیلزا / berdîlza/**: ناو. شەکبەران؛ بەرخە نێری سێ ساڵە ﷼ قوچ سه ساله

**بەردین / berdîn/**: ناوەڵناو. بەردینە؛ لە بەرد چێبوو؛ لە بەرد تاشراو ‹... ڕەها بن/ لە زیندانی بەردینی غارا «سوارە»› ﷼ سنگی

**بەردینە / berdîne/**: ☜ بەردین

**بەردێلک / berdêlk/**: ناوەڵناو. هاوتا ﷼ همشأن

**بەردێلی / berdêlî/**: ناو. ١. ژنبەژن ٢. کالا بە کالا ﷼ ١. زن به زن نکاح کردن ٢. معاملەی تهاتُری

**بەرز[1] / berz/**: ناو. برج؛ خانووە قووتکەی بان قەڵا ﷼ بُرج

**بەرز[2]**: ناوەڵناو. بڵند ‹بە سەروم وت کە: ڕاستە، سەرکەش و بەرزی! کەچی لەرزی/ کە فەرقیشم بگاتە ئاسمان، بەندەی قەدی یارم «نالی»› ﷼ بُلند

⊡ **بەرز بونەوە** بەرزەو بوون: ١. ڕاست بوونەوە؛ هەستان ٢. /مەجاز/ تەرەقی کردن ٣. بۆ سەر چوون ﷼ ١. از جا برخاستن ٢. ترقی کردن ٣. به سمت بالا رفتن

**بەرز کردنەوە** ١. هەڵێنان؛ ڕاکرن؛ بڵند کردن ٢. بەرەو بان بردن ٣. /مەجاز/ تەرەقی دان ﷼

١. بلند کردن ٢. به سمت بالا بردن ٣. ترقی دادن

**بەرزەو بوون** ☜ **بەرز بوونەوە**

**بەرز**[٢]: ئاوەلکار. لە سەرەوە ‹دەستت بەرز بگرە› ☰ بالا

**بەرزا / berza/**: ئاوەلناو. یەکەم منداڵ؛ هەوەڵ فرزەند ☰ اولین فرزند

**بەرزاخ / berzax/**: ناو. بەروار؛ قەدی کێو؛ نێوان بنار و بەرزایی کێو ☰ کمر کوه

**بەرزاخوڕ / berzaxuř/**: ئاوەڵناو. ١. فێرە ئالفی خۆش (بۆ چارەوێ) ٢. /کنایە/ بەفیز؛ فیسن؛ خۆبایی ☰ ١. بدعادت شده (اسب و استر) ٢. مُتکبر

**بەرزاندن / berzandin/**: چاوگ. شەڕ کردن ☰ جنگیدن

**بەرزایەتی / berzayetî/**: ناو. بلندایەتی ☰ بلندی

**بەرزایی / berzayî/**: ناو. بەرزایەتی ☰ بلندی

**بەرزپەڕ / berzpeř/**: ☜ **بەرزەفڕ**

**بەرزفڕ / berzfiř/**: ئاوەڵناو. ١. ☜ **بەرزەفڕ** ٢. /مجاز/ چاو لە بەرەژوور ☰ ١. ☜ **بەرزەفڕ** ٢. بلندپرواز (آدم)

**بەرزڤک / berzvik/**: ناو. تیغە و لەمپەر لە جنسی تەختە و دار ☰ مانع چوبی

**بەرزواچ / berzwaç/**: ناو. بلیندگۆ ☰ بُلندگو

**بەرزۆخە / berzoxe/**: ناو. بەرزۆڵە؛ منارە ☰ مَنارە

**بەرزۆڵە / berzole/**: ☜ **بەرزۆخە**

**بەرزە**[١] **/ berze/**: ناو. ١. بەرزەک؛ قیتایی لە ناو تەختاییدا ‹لێم بۆتە بەرزەی بانان› ٢. شیوی برنج؛ پلاو ☰ ١. برجستگی وسط هموار ٢. پلو

**بەرزە**[٢]: ئاوەڵناو. ١. بەزر؛ گوم؛ ونداببوو؛ ون ٢. تایبەتمەندی ئاژەڵی گەورە وەک: گا، وڵاخ و ... بەرانبەر: **وردە** ☰ ١. گم؛ ناپیدا ٢. دُرُشت (احشام)

**بەرزە -**[٢]: پێشوشە. بەرز ☰ بُلند

**بەرزەبلێس / berzeb(i)lês/**: ئاوەڵناو. /پلار/ زۆربلێی نەزان ☰ ژاژخا

**بەرزەبلێسە / berzeb(i)lêse/**: ئاوەڵناو. /پلار/ زۆربلێ ☰ وراج

**بەرزەپا**[١] **/ berzepa/**: ناو. بەرزەپێ؛ ئاژەڵی بەرز. بەرانبەر: **وردەپا** ☰ احشام دُرُشت

**بەرزەپا**[٢]: ئاوەڵکار. بەرزەپێ؛ گورج؛ گورجی (بۆ هەستانەوە) ‹بەرزەپا هەستا› ☰ سریع (قیام)

**بەرزەپەڕ / berzepeř/**: ئاوەڵناو. بەرزەفڕ ☰ بلندپرواز

**بەرزەپێ / berzepê/**: ☜ **بەرزەپا**

**بەرزەجرە / berzec(i)ře/**: ناو. بەرزەجوڕە؛ بەرزەچڕ؛ بەرزەچرە؛ سیسرکی دەشت؛ جرجر ☰ چرلسک

**بەرزەجوڕە / berzecuře/**: ☜ **بەرزەجرە**

**بەرزەچڕ / berzeçiř/**: ☜ **بەرزەجرە**

**بەرزەچرە / berzeç(i)ře/**: ☜ **بەرزەجرە**

**بەرزەحوایلە / berzeh(i)wayle/**: ناو. بادەوە؛ کۆلارەی لە قاقەزی منداڵان ☰ بادبادک

**بەرزەحەوایلە / berzeĥewayle/**: ناو. بەرزەحەوایی؛ بەرزەهەوایلە؛ بادەوە؛ فڕۆنەک؛ کۆلارەی منداڵان؛ فڕۆکەی منداڵان لە کاغەز و پەلاستیک کە بە بەنێکەوە هەڵیدەدەنە هەواوە ☰ بادبادک

**بەرزەحەوایی / berzeĥewayî/**: ناو. ١. ☜ **بەرزەحەوایلە** ٢. بەردێکی درێژۆکە بە پەتێکییەوە دەیبەستن و هەڵیدەدەن بۆ حەوا، وەک مووشەک دێتە خوارێ ☰ ١. ☜ **بەرزەحەوایلە** ٢. سنگ بازی بادبادک

**بەرزەخ**[١] **/ berzex/**: ناو. بەرزەق ☰ برزخ

**بەرزەخ**[٢]: ئاوەڵناو. توورە ☰ عصبانی

**بەرزەدەماخ / berzedemax/**: ئاوەڵناو. لووتبەرز؛ خۆبایی ‹بۆ کەسێکە مەی دڵی پڕ بێ لە داخ/ بۆچی لێی بخواتەوە بەرزەدەماخ؟ «هێمن»› ☰ مغرور

**بەرزەدەماخی / berzedemaxî/**: ناو. دەعیە و دەمار؛ لووتبەرزی ‹ها، هاکا هەوای بەرزەدەماخی/

ڕەنگ ژیان کرد لە مەزرام یاخی «کاک ئەحمەد»» ☰ غرور

**بەرزەردکە** / berzerdke/: ☜ **بەرگایلکە**

**بەرزەردیلە** / berzerdîle/: ☜ **بەرگایلکە**

**بەرزەڕێنە** / berzeřêne/: ناو. زەبەرجەد؛ بەردێکی زەردی ئاماڵ سەوزی بەقیمەتە و دەترووسکێ، دەیکەنە نقێم و قاش ☰ زَبَرجَد

**بەرزەفڕ** / berzefiř/: ئاوەڵناو. بەرزفڕ؛ بەرزپەڕ: ١. لێهاتوو بۆ فڕین لە بەرزایی ‹وەرە ئۆخژنی سینەی پڕگڕی من!/ وەرە پیرۆزەکەی بەرزەفڕی من «هێمن»› ٢. *[مەجاز]* حەزۆک بۆ پێشکەوتن و سەرکەوتنی لە ڕادەبەدەر ‹هەر کەسێ بەرزەفڕە زوو دەمرێ/ بای بلێندایی سەر و دڵ دەگرێ «هەژار، *بۆ کوردستان*»› * هەروەها: **بەرزەفڕی** ☰ ١و٢. بلندپرواز

**بەرزەق** / berzeq/: ☜ **بەرزەك**

**بەرزەک** / berzek/: ناو. بەرزەق؛ بڵندایی نێوان تەختایی ☰ برزخ

▣ **بەرزەکی بانان** ١. پەرژینی لە نەردە یان دیوار بە سەر لێواری بانەوە ٢. *[مەجاز]* لاوی تۆلاز و دلتەڕ ☰ ١. جان‌پناه بام ٢. جوان چشم‌چران

**بەرزەگەوە** / berzegewe/: ناو. دەستەکی پەرژین ☰ تار پرچین

**بەرزەلنگ** / berzeling/: ☜ **بەرزەڵنگ**

**بەرزەلینگ** / berzelîng/: ناو. زەنگۆڵەگیا؛ بنەگیایەکی خۆڕسکە بە لقی باریک، گەڵای وردی تێک‌ئاڵاوی کولکن و گوڵی ورد و تۆپەڵی بۆنخۆش و هێندێک تاڵ و تفتەوە ☰ خَنج

**بەرزەڵنگ** / berzełing/: ناو. بەرزەلنگ؛ گیایەکی باڵابەرزە لە تیرەی پنگ و جاترە ☰ گیاهی از تیرەی پونە

**بەرزەمژ** / berzemij/: ☜ **بەرزەمژی**

**بەرزەمژی** / berzemijî/: ئاوەڵناو. بەرزەمژ؛ دلفەرا؛ خاوەن هەست و بیری بەرز ‹لای هەڵۆی بەرزەفڕی بەرزەمژی/ چۆن بژی شەرتە نەوەک چەندە بژی «سوارە»› ☰ بُلندنظر

**بەرزەملێ** / berzem(i)lê/: ☜ **باڵابەرزە**

**بەرزەواچ** / berzewaç/: ناو. بڵنگۆ؛ بڵیندگۆ ☰ بلندگو

**بەرزەولاخ** / berzew(i)łax/: ناو. یەکسم ☰ ستور

**بەرزەوەکراو** / berzewek(i)raw/: ئاوەڵناو. هەڵگیراو؛ هەڵکراو؛ هەڵگیریاگ ☰ برداشته شده

**بەرزەهەوایلە** / berzehewayle/: ☜ **بەرزەحەوایلە**

**بەرزەیی** / berzeyî/: ئاوەڵکار. بە دزییەوە ☰ پنهانی

**بەرزی** / berzî/: ناو. بەرزێتی: ١. بڵندی ٢. گەورەیی ‹شاعیر بۆ پارە هیچ ناکا پەلە/ ئارەزووی شاعیر هەر بەرزی گەلە «قانع»› ☰ ١. بلندی ٢. بلندپایگی

**بەرزیلان** / berzîlan/: ناو. ئەسکەملە؛ شێر و خەت ☰ بازی شیر یا خط

**بەرزیلە** / berzîle/: ناو. ئاتەک؛ شاقەل؛ تریج ☰ تریز

**بەرزین**[١] / berzîn/: ناو. ١. قەڵتاخ؛ قەڵپۆز؛ کەڵبەزین ٢. نەرمەزین؛ خلۆرتە ☰ ١. قاچ زین ٢. نمد زین

**بەرزین**[٢]: ئاوەڵناو. لەبار بۆ گرتن و زین کردن ☰ آمادەی زین بستن

**بەرزێتی** / berzêtî/: ☜ **بەرزی**

**بەرژنامە** / berjename/: ناو. فۆرم؛ پرسیارنامە ☰ فُرم

**بەرژەند** / berjend/: ☜ **بەرژەوەند**

**بەرژەنگ** / berjeng/: ناو. دەسپێک؛ سەرەتا ☰ سرآغاز؛ آغاز

**بەرژەنە** / berjene/: ناو. بەرمەمەشکە؛ ئەو کەرەیەی لە یەک جار مەشکە ژەندن پەیدا دەبێ

■ کرەی یکبار مشک

**بەرژەنەک** / berjenek/: ناو. دەپی پێوانی کری تەون ■ تختەی اندازەگیری تنیدەی فرش

**بەرژەوەن** / berjewen/: ☜ **بەرجەوەن**

**بەرژەوەند** / berjewend/: ناو. بەرژەند: ١. بەرجەوەن؛ دیمەنی پێش چاو ‹هەر وەکوو باران لە چاوم دێتە خوارێ ئەشکی خوێن/ هەر زەمانێک بەرژەوەندێکی لە حالی خۆم دەکەم «هێمن»› ٢. بەرژەوەندی؛ بەرجەوەنگ؛ مەسلەحەت ‹ئەم رێکەوتنە لە بەرژەوەندی هەموو خەڵکە› ٣. کەڵک؛ سوود؛ بەهرە ■ ١. منظره ٢. مصلحت ٣. منفعت

**بەرژەوەندی** / berjewendî/: ☜ **بەرژەوەند ـ٢**

**بەرساوتە** / bersawte/: ناو. سابات ■ سایبان

**بەرستک** / bers(i)tik/: ناو. بەرستۆ ■ جلو یقه

**بەرستۆ** / bers(i)to/: ناو. بەرسکوور؛ یەخە؛ بەر مل؛ خوار گەردن و بالای سینگ ■ یقه

**بەرستورک** / ber(i)stûrik/: ☜ **بەستورک**

**بەرستە** / beriste/: ناو. بەردئەستێ ■ سنگ آتشزنه

**بەرسفکە** / bersifke/: ناو. هەیوان ■ ایوان

**بەرسڤ** / bersiv/: ناو. پەرسڤ؛ وەرام؛ وەڵام؛ جواب ■ جواب؛ پاسخ

**بەرسڤک** / bersivk/: ناو. ١. هەیوان ٢. بەربێلایی ■ ١. ایوان ٢. تراس

**بەرسک** / bersik/: ناو. رێتک؛ بەرگەدە ■ قسمت زیر شکم

**بەرسکوور** / bers(i)kûr/: ناو. بەرستۆ؛ بەر مل ■ یقه

**بەرسم** / bersim/: ناو. گەڵای دار ■ برگ درخت

**بەرسمبێل** / bersimbêl/: ☜ **بەرسمێڵ**

**بەرسمێڵ** / bersimêl/: ناو. بەرسمبێل؛ بەرسوێل؛ ئەو بەشە لە مووی سمێڵ کە سەر لێو دەگرێ ‹ئەرێ ئەو بەرسمێلەت بۆ ناکەی؟ ئاوا چۆن چێشتت پێدەخورێ؟› ■ موی سبیل که بر روی لب آید

**بەرسنجک** / bersincik/: ناو. سووکە نزگەرە ■ سکسکەی خفیف

**بەرسورکە** / bersurke/: ناو. سیسرەی ناو ماڵ کە وەک قالۆچە دەچێ ■ سوسک خانگی

**بەرسوڤ** / bersuv/: ناوەڵناو. وەرگەڕاو؛ سەرەونخوون؛ نخوون؛ قلپ ■ وارونه

**بەرسوێل** / bers(i)wêl/: ☜ **بەرسمێڵ**

**بەرسۆلکە** / bersolke/: ☜ **بەرسورکە**

**بەرسۆلینگ** / bersolîng/: ناو. سنگبەخەنە ■ پرندەای است

**بەرسوورکە** / bersûrke/: ناو. بەرسۆلکە؛ جۆرێ کارگی وردی زەردە لە مێرگان دەڕوێ ■ نوعی قارچ ریز زرد

**بەرسووڤ** / bersûv/: ناوەڵناو. بەرشووش؛ سەرەونخوون؛ سەروژێر ■ وارونه

**بەرسەفهێن** / bersefhên/: ناو. باخیر؛ خەبەرهێن ■ خبررسان

**بەرسیسانی** / bersîsanî/: ناو. ئامرازی مشت و ماڵ ■ وسایل مشت و مال

**بەرسیلە** / bersîle/: ناو. قۆرە؛ بەسیلە؛ پەسیرە؛ پەسیلە؛ هاڵە؛ کالکی ترێ؛ ترێی هێشتا ترش ■ غوره

**بەرسیلەمارانە** / bersîlemarane/: ناو. پەسیرەمارانە؛ قۆرەمارانە؛ هاڵەمارانە ■ نوعی غوره

**بەرسینچکە** / bersînçke/: ناو. نزگەرە ■ سکسکه

**بەرسینگ** / bersîng/: ناو. بەرسینە؛ بەرسینگە؛ سینەبەندی زین ■ سینەبند زین

**بەرسینگە** / bersînge/: ناو. ١. ☜ **بەرسینگ** ٢. بەرسینە؛ ناوقەد ‹بەفر بەرسینگەی بڕیبوو› ■ ١. ☜ **بەرسینگ** ٢. نیمقد

⊡ **بەرسینگە لێبڕینەوە**: کاری پێش لێ گرتن و رێگەی دەرچوون برین ■ راه را سد کردن

**بەرسینە / bersîne/:** ☜ بەرسینگ

**بەرسێبەر / bersêber/:** ناو. شەم ☰ جای سایە

**بەرسێل / bersêl/:** ناو. کولێرەی بە ساج برژاو ☰ نوعی گردەنان

**بەرشووش / berşûş/:** ناوەڵناو. سەرەونخوون؛ سەروژێر؛ بەرسووف ☰ وارونە

**بەرشەنۆم / berşenom/:** ناو. کار و ڕەوتی جیا کردنەوە و دوور ڕاگرتنی گیانداری نەخۆش لە ساخەکان ☰ قرنطینە

**بەرشیو / berşîw/:** ناو. بەرکول؛ بەرشێو؛ کاری خواردن بەر لە چێشت پێگەیشتن ☰ عمل از سرجوش خوردن

**بەرشێو / berşêw/:** ☜ بەرشیو

**بەرعۆدە / ber'ode/:** ناوەڵناو. دەستەبەر ☰ متعهد

**بەرغەل / berğel/:** ناو. بەرخەل؛ بەرگەل؛ گەلەی بەرخ و کار ☰ گلەی برّه و بُزغالە

**بەرغەلەوان / berğelewan/:** ناو. بەرخەلەوان؛ بەرگەلەوان؛ بەرخەوان؛ شوانی بەرغەل ☰ چوپان برّه

**بەرف / berf/:** ناو. بەفر؛ ومور؛ وەروە ☰ برف

**بەرفخۆر / berfxor/:** ناو. باڵدارێکە ☰ پرندەایست

**بەرفخۆرک / berfxorik/:** ناو. جۆرێ تەرزەی ورد ☰ تگرگ ریز

**بەرفراوان / berf(i)rawan/:** ☜ بەرفەریح

**بەرفراوانی / berf(i)rawanî/:** ناو. بەرینایی ☰ گُشادی

**بەرفرە / berf(i)re/:** ناوەڵناو. بەرفڕە: ١. بەرگوشاد؛ هەراو ٢. پان و بەرین ☰ ١. گُشاد ٢. عریض

**بەرفڕە / berf(i)ře/:** ☜ بەرفرە

**بەرفماڵک / berfmałik/:** ناو. وەروەرە؛ پارۆی بەفر ماڵین ☰ پاروی برفروبی

**بەرفەرمان / berferman/:** ناوەڵناو. سەرخوار؛ گوێڕایەڵ ☰ مُطیع

**بەرفەرمانی / berfermanî/:** ناو. گوێڕایەڵی؛ فەرمانبەری ☰ فرمانبرداری

**بەرفەریح / berferîĥ/:** ناوەڵناو. بەرین؛ بەرفراوان ☰ وسیع

**بەرفەشۆ / berfeşo/:** ناو. شلێوە؛ دوودانگ؛ بەفر و باران پێکەوە ☰ بارش برف و باران با هم

**بەرفەک / berfek/:** ناو. ١. جۆرێ مێزەر و پێچەسەری پیاوانە ٢. ئەو بارستا سەهۆڵەی دیوارەی یەخچاڵ لە ناوەوە دەیگرێ ٣. ئەو وردە پەڵە سپییانەی دەکەوێتە سەر شاشەی تەلەڤیزیون ☰ ١. نوعی عمامەی مردانە ٢. برفک یخچال ٣. برفک تلویزیون

**بەرڤاژی / bervajî/:** ناوەڵناو. بەراوەژوو؛ سەرەونخوون ☰ وارونە

**بەرڤاڵە / bervałe/:** ناوەڵناو. *[مەجاز]* هەژار؛ نەدار؛ دەسبەتاڵ ☰ بینوا

**بەرڤان / bervan/:** ناو. شوان ☰ چوپان

**بەرڤانک / bervanik/:** ناو. بەروانکە؛ سینەبەندی کار کردن ☰ پیشبند

**بەرڤانەک / bervanek/:** ☜ بەروانکە

**بەرڤە / berve/:** ناو. قەد ☰ تا؛ لایە

**بەرڤی / bervî/:** ناوەڵناو. تۆپیو؛ کەوتی؛ سەکەت؛ مردوو لە ڕێگەی خراپەدا ☰ هلاک

**بەرڤین / bervîn/:** چاوگ. مردن لە ڕێی خراپدا ☰ هلاک شدن

**بەرق / berq/:** ناو. ١. برووسکە؛ هەورەترێشقە؛ چەخماخە «خەندەمت بووەتە باعیسی گریانی دەمادەم/ بەرقە سەبەبی بارشی بارانی بەهاری «نالی»» ٢. ترووسکە؛ وریشە؛ ورشە ٣. کارەبا ☰ ١. آذرخش ٢. درخشش ٣. برق

⊡ **بەرق چوون:** قت بوونی کارەبا ☰ برق رفتن

**بەرق خستن:** ١. چەخماخە لێدان ٢. *[مەجاز]* ساوین و لووس کردن و بریقەدار کردن ٣.

/کینایە/ زۆر خاوێن کردنـەوە ≅ ۱. آذرخـش زدن ۲. برق انداختن ۳. تمیز کردن
**بەرق گرتن:** وێکەوتنی کارەبا ≅ برق گرفتن
**بەرق لێدان:** ۱. بە بەرق دەرمان کـردن ۲. بـەر برووسکەی هەور کەوتن ۳. /دوعا/ بەرقی هەور شـوێنێ گـرتن و زەرەر پـێ‌گەیانـدن ≅ ۱. برق‌درمانی کردن ۲و۳. برق زدن
**بـەرقـاپی / berqapî/:** نـاو. ئاسـانە؛ پـێش‌مـاڵ؛ بەرماڵـی گـەورەمالان ‹رەقیبـت دەرکـە! ئـەم بەردەرکـە پاکـە، پـیس ئـەکا، فـەرمووی:/ کـە بـەم بەرقاپییە لازم سەگێکی وایە، بۆ بڕوا؟ «مەحوی»› ≅ آستانە
**بەرقتین / berqitîn/:** چاوگ. قەڵشین ≅ شکافتن
**بەرقلیان / berqilyan/:** ناو. قاوەڵـتی؛ بەرتێشـت؛ بەرچایی ≅ ناشتا
**بەرقۆڵ / berqol/:** نـاو. ئاسەرِی سـەر دەسـت لـە کەوا ≅ آستر آستین
**بەرقەپ / berqep/:** ناوەڵناو. پولاو ≅ پوسیدە
**بەرقـەد / berqed/:** نـاو. قـەدپاڵ؛ لاپاڵـی کێـو ≅ سینەی کوە
**بەرقـەرار / berqerar/:** ناوەڵـناو. ۱. سـەقامگرتوو؛ دامـەزراو ‹نیشـانەی فـەخرە بـۆ ئێمـە کـە زاتێکـی وەهامـان بـێ/ ئیلاهـی بەرقـەراری کـەی! چراغـی میللەتی کوردە «بێکەس»› ۲. بەرهەڤ؛ ئامـادە ≅ ۱. پابرجا ۲. آمادە
**بەرقەراری / berqerarî/:** ناو. پایەداری؛ بەردەوامی ≅ پایداری
**بەرقەم / berqem/:** ناو. جـۆرێ ڕەنگـی سـوور ≅ نوعی رنگ سرخ
**بەرقەنە / berqenne/:** نـاو. بەرچایی؛ بەرتێشـت؛ بەرقلیان ≅ ناشتایی
**بەرقی / berqî/:** ناوەڵناو. کارەبایی؛ زوو ≅ برقی
**بەرقییە / berqîye/:** نـاو. برووسـکە؛ تێلگـراف ≅ تلگراف
**بـەرک¹ / berik/:** ناو. ۱. گوللە؛ فیشـەک ۲. گیفان؛ گیرفـان؛ جێـب؛ جیـو؛ باخـەڵ ۳. هەشـتەمین ئەستێرەی ڕووناکی ئاسمان لە وێنەی گەردوونی سەگی بچووکدا ≅ ۱. گلولـە ۲. جیـب ۳. سـتارەی شعرای شامی
**بەرک²:** ناوەڵـناو. پتـەو؛ سـەخت؛ قـایم ≅ سـخت؛ محکم
**بەرکاتی / berkatî/:** نـاو. کرێکـاری بـە وەخـت و سات ≅ کارگر ساعتی
**بەرکار / berkar/:** ناو. ۱. کەرەسـتەی ئامـادەکراو بۆ خانوو کردن ۲. کرێکـار ۳. /ڕێزمان/ بـەرکردار؛ ئەوی کاری بە سەردا کراوە ≅ ۱. مصالح ساختمانی آمادەی کار ۲. کارگر ۳. مفعول
**بـەرکاز / berkaz/:** نـاو. پەنجـەرە؛ دەرومچـە؛ دەلاقەی دیواودەر ≅ پنجره
**بەرکانی / berkanî/:** ناو. ۱. بەرەقانی؛ قەڵماسک؛ قۆچەقانی؛ کەمنیک ۲. خوارووی سەرچاوە ≅ ۱. فلاخن ۲. پایین چشمه
**بەرکاو / berkaw/:** ناو. بنار؛ داوێـنی کێـو؛ بنـاری چیـا ‹ڕابـردوو بـەرکاوی خەمێکـە زەرد و سـوور «شێرکۆ»› ≅ دامنەی کوە
**بەرکبڕ / berkbiř/:** نـاو. گیرفـانبڕ؛ کیسـەبڕ ≅ جیب‌بُر
**بەرکردار / berk(i)rdar/:** ناو. بەرکار ≅ مفعول
**بەرکزە / berkize/:** ناو. هاوردە؛ ئاوردە؛ هاوردی ≅ واردات
**بەرکم / berkim/:** ناو. ۱. گولاو ۲. قەفـەس ≅ ۱. گلاب ۲. قفس
**بەرکوت / berkut/:** ناو. ۱. دەغـڵ و کولۆشـێ کـە پێش لە خەرمان کوترابێ ۲. بەرکوڵ ≅ ۱. دانە و ساقەی پیش از خرمن کوبیدە شدە ۲. پیش‌غذا
**بەرکوتە / berkute/:** ناو. باڵدارێکە ≅ پرندەایست

**بەرکور** / berkur/: ناو. بەرچێڵە؛ بەرخەبەبەی شۆڕ 🇮🇷 غبغب

**بەرکوڕ** / berkuř/: ناو. جیقەڵدان 🇮🇷 چینەدان

**بەرکوڕە** / berkuře/: ناو. قوڵتە؛ باڵدارێکی بچووکە 🇮🇷 پرندەای کوچک

**بەرکوژە** / berkuje/: ناو. قەیتانێ بۆ داخستنی یەخەی کراس بە گرێ دان 🇮🇷 بندِ یقه

**بەرکوڵ**[1] / berkuł/: ناو. بەرکۆڵ؛ بەکوڵ؛ بەرکەڵ؛ بەرکەڵ: ١. نۆکەڵ؛ بەرشێو؛ تۆزە چێشتێ کە پێش کوڵانی دەیچێژن ٢. بەرکوت؛ تۆزە پێخۆرێ کە بەر لە وادەی ژەمەن دەیخۆن ❋ هەروەها: **بەرکوڵ کردن** 🇮🇷 ١. سرجوش ٢. پیش‌غذا

**بەرکوڵ**[2]: ئاوەڵناو. بەرکەڵ؛ تەواو نەکوڵاو 🇮🇷 نیم‌پخته

**بەرکۆ** / berko/: ناو. ١. قەڵپووزی زین ٢. بەرکوتی دەغڵ ٣. لای ژێرووی خەرمان 🇮🇷 ١. قاچ زین ٢. پیش کوبیدەی غله ٣. پایین خرمن

**بەرکۆز** / berkoz/: ناو. جێگای تفاق پێدانی ئاژەڵ لە زستاندا 🇮🇷 جای زمستانەی علف دادن بە گوسفندان

**بەرکۆژە** / berkoje/: ناو. ١. بەر؛ پێسیر؛ دادڕاوی یەخە تا سەر سنگ ‹نە شەوە شەوم و نەڕۆژم ڕۆژە/ داخ لە دڵ بوومە گرێی بەرکۆژە «هەژار، بۆ *کوردستان*»› ٢. دوگمە و قەیتانی سەر کراس کە سینگ و بەرۆک دادەپۆشێ 🇮🇷 ١. گریبان ٢. دُکمە و قیطان گریبان پیراهن

**بەرکۆستە**[1] / berkoste/: ناو. بەرکۆسەر؛ بنی دیوار 🇮🇷 پای دیوار

**بەرکۆستە**[2]: ئاوەڵناو. بەرکۆسە؛ ڕیش‌تەنکی کەم‌موو 🇮🇷 ریش‌تُنُکِ کم‌مو

**بەرکۆسە** / berkose/: ☜ **بەرکۆستە**[2]

**بەرکۆسەچ** / berkoseç/: ناو. کۆسە 🇮🇷 کوسە؛ بی‌ریش

**بەرکۆسەر** / berkoser/: ☜ **بەرکۆستە**[1]

**بەرکۆش** / berkoş/: ناو. بەروانکە؛ بەرەڵبێنە؛ بەرهەڵبێنە؛ کۆش‌پۆش لە کاتی کاردا 🇮🇷 پیشبند

**بەرکۆڵ** / berkol/: ☜ **بەرکوڵ**[1]

**بەرکۆڵە** / berkołe/: ناو. دارێ دوو لکە دەیخەنە ناو ئێرەقە و مژانە 🇮🇷 از قطعات خیش

**بەرکە** / berke/: ناو. ١. خێر و بەرەکەت؛ پیت ‹مەڕەسوور دوو بەرخە مێ زاوە، هەی بەرکە کەی!› ٢. جێگەی سوار کردنی زۆرتر منداڵ لە سەر وڵاخ یا موتور و دووچەرخە، لە پێشەوە ‹هەرتا مناڵ بووم ئەمیانتا بەرکە/ ئیسە گەورە بووم بارم لە تەرکە! «فولکلۆر»›. بەرانبەر: **پشکە** ٣. دیو؛ ژوور؛ وەتاغ 🇮🇷 ١. برکت ٢. جلو ٣. اتاق

**بەرکەتۆپ** / berketop/: ناو. قومبەرە؛ قومبولە؛ گوللەی تۆپ 🇮🇷 گلولەی توپ

**بەرکەتی** / berketî/: ئاوەڵناو. بەرکەفتی: ١. هەڵکەوتە؛ هەڵکەوتوو؛ بلیمەت ٢. هێژا؛ شیاوی ڕێز لێ گرتن 🇮🇷 ١. نابغه ٢. شایسته

**بەرکەش** / berkeş/: ناو. سینی؛ یالتەبەق 🇮🇷 سینی

**بەرکەشۆک** / berkeşok/: ناو. کەشەفی چکۆلانە 🇮🇷 سینی کوچک

**بەرکەفتی** / berkeftî/: ☜ **بەرکەتی**

**بەرکەڤ** / berkev/: ناو. هەل؛ دەرفەت 🇮🇷 فرصت

**بەرکەک** / berkek/: ناو. پەیژە؛ پێپلیکە؛ نەردیوان؛ سلەم 🇮🇷 نردبام

**بەرکەل** / berkel/: ☜ **بەرکوڵ**

**بەرکەڵ** / berkeł/: ناو/ ئاوەڵناو. نێنگوون؛ نوێنگین؛ نوگوهان؛ دامنەچەقان؛ (مانگای) سێ‌ساڵان 🇮🇷 تلیسه

**بەرکەمرە** / berkemre/: ناو. کەمر؛ کۆمرە؛ خەڵووزە بەردینە؛ بەردێکە ئاگر دەگرێ و لە پیشەسازیدا وەک سووتەمەنی بەکار دەچێ 🇮🇷 زُغالسنگ

**بەرکەمـەر** / berkemer/: نـاو. ١. گیایەکی گەرمەسێری و بۆنخۆشە ‹نووکی موژگانی ئەمەندە خوێنی جەرگی ڕشتووە/ سل ئەکا ئەمڕۆ لە سووری سوورهەڵاڵی بەرکەمەر «قانع»› ٢. سەربەرگەدە؛ بەرناوک ☰ ١. گیاهی است خوشبو ٢. زیرِ ناف

**بەرکـەنارکراو** / berkenark(i)raw/: ئاوەڵنـاو. لێخراو؛ لە سەر کار دەرکراو ☰ برکنار شده

**بەرکەندال** / berkendal/: ناو. تەپلک ☰ آبکند

**بەرکەوا** / berkewa/: ناو. زەخەرە؛ ئاسەر ☰ آستر

**بەرکەیـە** / berkeye/: نـاو. ١. بریکـار؛ نوێنـەر ٢. یاریدەر؛ هاریکار ☰ ١. نماینده ٢. همکار

**بـەرکـهـور** / berkihûr/: نـاو. بـەرهوور؛ تفـەنگی خانەتەنگ ☰ تفنگ خان‌تنگ

**بەرکێش** / berkêş/: ناو. ١. بەردکێش ٢. خەرەک؛ خەرەکی ٣. کرێکارێ کە لـە کـاتی هۆڵـەدا بـە شەنکێش ژێر خەرمانکوتەکـە خالـی دەکـا ☰ ١. سنگ‌کش ٢. وسیلەی حمل سنگ ٣. کـارگر ماشـین خرمنکوب

**بەرکێشک** / berkêşik/: ناو. کەشاو؛ چەکمەجـە ☰ کشو میز

**بەرکێڵ** / berkêł/: ناو. زەوینی وەختی کـێلان ☰ زمین شخمی

**بەرگ** / berg/: ناو. ١. گەڵا؛ پەلک؛ بەڵگ ‹بولبـول دەخوێنـێ، بـا لـە دەفی بـەرگی گـوڵ دەدا/ غونچـە لەباتی گوێ بگرێ، دەم دەکاتەوە! «حاجی قادر»› ٢. جلد؛ یەکەی هـەژماردنی کتێـب و گۆڤـار ‹سـێ بەرگ کتێب› ٣. پشتە کتێب ‹بەرگی ئەم کتێبـەم پێ جوانە، بەڵام هێندێک ناسکە› ٤. پۆشاک؛ جـل؛ جلک ‹ئایری هیجران کەوتەن نە جـەرگم/ سـیاوش کەردەن سەرتاپای بەرگم «سەیدی»› ٥. دۆز؛ مەرام ٦. رووکـێش ٧. *[کینایە]* دارایـی؛ مـاڵ و سـامان ‹بەرگی دنیا هێندە کورت و کۆنە و بازاڕییـە/ چونکـە ناگاتە گوێی دێوانەکەی لێی عارییـە! «نـالی»› ☰ ١. برگ ٢. جلد ٣. روجلد ٤. لباس ٥. رَویە؛ مرام ٦. رویە؛ روکش ٧. ثروت و سامان

⊡ **بەرگ پێدا گرتن**: ☜ **بەرگ تێگرتن**

**بـەرگ تێگرتن**: بـەرگ پێـدا گـرتن: ١. جلـد کردنی کتێب ٢. دە قوماش هەڵکێشانی لێفـە و ... ☰ ١. جلد گرفتن کتاب ٢. ملحفـە کشـیدن؛ رویە گرفتن

**بەرگ گرتن**: بەرگ تێگرتن ☰ جلد کردن

**بەرگ** / berig/: ئاوەڵناو. ١. پێشوو؛ بـەرێ ‹جـاری بەرگ هاتم، نەبووی› ٢. لـە بـەرەوە؛ لـە پێشـەوە ‹دیان بەرگم ئێشێ› ☰ ١. قبلی ٢. جلوی

**بەرگا** / berga/: ناو. کەسێ پێش گای تـازەجووت دەکەوێ تا فێری کا ☰ آنکە گاو را شخم آموزد

**بـەرگاز** / bergaz/: نـاو. ١. کووتالـی بـەرپان ٢. خلێف و کەنووی هەنگ ☰ ١. پارچەی عـریض ٢. کندوی زنبور عسل

**بـەرگاژۆ** / bergajo/: نـاو. بەڵـگاژۆ؛ تەسـێق ☰ گواهینامەی رانندگی

**بەرگاویلکە** / bergawîlke/: ☜ **بەرگایلکە**

**بەرگاویلە** / bergawîle/: ☜ **بەرگایلکە**

**بەرگایلکـە** / bergayilke/: نـاو. بەرزەردکـە؛ بەرزەردیلە؛ بەرگاویلکە؛ بەرگاویلـە؛ بەرگاییلکـە؛ قوون‌هەڵتەکێنە؛ کلک‌هەڵـتەکێنە؛ گاچـەڕِنگ؛ گاچێڕین؛ خێزانە مەلێکی جۆراوجۆرن بە لەشـی باریک و کلکی درێژ، دنـدووک و لاقـی باریکـەوە کە مـێش، جالجالـووکە، شـەیتانۆکە و دانەوێلـە دەخۆن و بریتین لە بەرگایلکـەی بـۆر، بەڵـەک، زەرد و سەرزەرد ☰ دُم‌جنبانک

**بەرگایی** / bergayî/: ناو. کاری هەڤۆتنی گا؛ بوونە بـەرگا؛ کـاری پـێش گـا کـەوتن لـە جووتـا بـۆ ڕاهێنانی. هەروەها: **بەرگایی کردن** ☰ عمل شـخم به گاو آموختن

**بەرگاییلکە** / bergayîlke/: ☜ **بەرگایلکە**

**بەرگاییلە / bergayîle/**: ناو. پێشگاییلە؛ بەرگاییلکە؛ باڵندەیەکی چووکە کاتی شێفبڕین لە سەر خەتی جووت بە دوای کرمدا دەگەڕێ ≣ پرندەای کرمخوار

**بەرگدروو / bergd(i)rû/**: ناو. بەرگدوور؛ دروومانکار؛ جلدروو؛ خەیات ≣ خیاط

**بەرگدڕاو / bergd(i)řaw/**: ناوەڵناو. تیقەڵۆ؛ جلشڕ؛ شڕۆڵ ≣ ژندەپوش

**بەرگدوور / bergdûr/**: ☜ بەرگدروو

**بەرگدووری / bergdûrî/**: ناو. خەیاتی؛ پیشەی جلدوور ≣ خیاطی

**بەرگر[1] / bergir/**: ناو. ١. *(باوەڕی کۆن)* ژنێ کە منالی بە سووتان مردووە و ودمی هەیە، خوێ و سماق بە زیپکە و بلۆقی ئاگردا کات ناهێڵێ بتەنێتەوە ٢. بەروانکە ٣. *(مەجاز)* سپەر؛ سپێر ٤. لەمپەر ٥. بەرگرد؛ داری ناو تەون بۆ ڕاست وەستان ≣ ١. زنی کە فرزندش در آتش سوخته، به باوری، نمک یا سماق بر جوش و تاول ریزد، مانع از انتشار آن گردد ٢. پیشبند ٣. سپر ۴. مانع ۵. چوب دستگاه قالیبافی

**بەرگر[2]**: ناوەڵناو. ١. پێشگر لە بەرێوەچوونی کار ٢. بەردار؛ بارهێنەر ≣ ١. مزاحمِ کار ٢. بارور

**بەرگرانە / bergirane/**: ناو. کۆمەک و یارمەتی شەڕکەرانی چەکدار ≣ کمک پشت جبهه

**بەرگرد / bergird/**: ناو. ١. بەرگر؛ کاری شتی نەخۆشەویست بۆ پاراستنی خۆشەویست دەکار کردن ٢. ☜ بەرگر[1]-٥ ≣ ١. عمل به کار گرفتن چیز بی‌ارزش برای حفظ باارزش ٢. ☜ بەرگر[1]-٥

**بەرگردەڵە / bergirdele/**: ناو. دارێکە دەخرێتە ژێر پازناو ≣ چوبک زیر اهرم

**بەرگری / bergirî/**: ناو. بەرگیری: ١. بەرەڤانی؛ بەرەنگاری؛ کار و ڕەوتی وەستانەوە لە بەرانبەری مەترسی یان هێرشدا ٢. پێشگری؛ بەربێچ؛ کار و چارێک بۆ ڕوونەدانی ڕووداوێک لە داهاتوودا ≣ ١. دفاع ٢. پیشگیری

**بەرگشڕ / bergşiř/**: ناوەڵناو. گێتە؛ شڕەبار ≣ ژندەپوش

**بەرگن / bergin/**: ناو. لوا؛ تووک؛ کوڵکەی وشتر و بەرخ ≣ کُرک شتر و برّه

**بەرگوارە / berg(i)ware/**: ناو. زەنگەتە ترێ ≣ خوشەی انگور

**بەرگورد / bergurd/**: ناو. دارگورد؛ دارێ لە نێوان ڕایەڵ و پۆی تەوندا بۆ ڕاست کردنی ≣ چوب میان تار و پود در قالیبافی

**بەرگوشاد / berguşad/**: ☜ بەرفرە -٢

**بەرگوێزنگ / berg(i)wêzing/**: ناو. پاچەقوڵێ؛ جومگەی پا؛ سەری قولەقاپە ≣ مُچ پا

**بەرگوز / bergûz/**: ☜ بەربوز

**بەرگە[1] / berge/**: ناو. تاقەت؛ بڕست؛ کاری پێوەستان؛ دەربردن ≣ تاب؛ تحمل

⊡ **بەرگە گرتن:** دەربردن؛ دەگەڵ دەرد و دژواریدا هەڵکردن ‹تا ئێستا بەرگەی ئەم هەموو مەینەتەمان گرتووە› ≣ تاب آوردن

**بەرگە[2]**: پێشواژە. بەرگ؛ جلد ‹بەرگەپشتی؛ بەرگەکتێو؛ بەرگەلێفە› ≣ رویه

**بەرگەدە / bergede/**: ناو. شەرم؛ شەرمگا؛ جێگەی ڕوانی تووکەبەر؛ لای هەرە خوارووی ورگ ≣ زهار

**بەرگەدەتراش / bergedet(i)raş/**: ☜ بەرتاش-٢

**بەرگەڕ / bergeř/**: ناو. خوانچەی دەسفرۆشی ناو بازار ≣ سینی دستفروش

**بەرگەڕەکێ / bergeřekê/**: ناو. جوانی گەڕەک (زۆرتر بۆ کەڵەباب و ئەسپی دەڵێن) ≣ زیبای محل (برای خروس و اسب به کار می‌رود)

**بەرگەش / bergeş/**: ناو. بەرکەش؛ یاڵتەبەق؛ سینی ≣ طبق؛ سینی

**بەرگەشتە / bergeşte/:** ئاوەڵناو. ١. کڵۆڵ؛ چارەڕەش؛ بەدبەخت ٢. چەماوە؛ هەڵەوگەڕیاگ ‹بەو موژە بەرگەشتەیەی ئەو دولبەرە/ وەرگەڕای کاکە لە دین، بۆ مەسخەرە! «هێمن»› ☰ ١. بیچارە ٢. خمیدە

**بەرگەشتی / bergeştî/:** ناو. بەدبەختی؛ نەهات ☰ بدبختی

**بەرگەگر / bergegir/:** ئاوەڵناو. خۆڕاگر؛ خۆگر ☰ مُقاوم

**بەرگەگری / bergeg(i)rî/:** ناو. خۆڕاگری؛ باشار ☰ مُقاومت

**بەرگەل / bergel/:** ☜ بەرغەل

**بەرگەلە / bergele/:** ناو. دواشوان؛ یاریدەری شوان ☰ دستیار چوپان

**بەرگەلەوان / bergelewan/:** ☜ بەرغەلەوان

**بەرگەڵا / bergeła/:** ناو. بەرێکە لە گەڵای دارمازوو دەردەچێ ☰ از ثمرهای مازوج

**بەرگەمێ / bergemê/:** ناو. گیاکووز؛ کووزەڵە ☰ ترتیزک آبی

**بەرگەمێو / bergemêw/:** ناو. پەلکەمێو؛ گەڵامێو؛ ئاپراخ ☰ برگ مو

**بەرگەنووشتە / bergenûşte/:** ناو. قەمزەنووشتە ☰ پوشش دعای نوشته

**بەرگەهەوا / bergehewa/:** ناو. تەوشک؛ ئەتموسفیر؛ ئەو کەشە گازانە دەوری گۆی زەوینیان گرتووە ☰ اتُمسفر

**بەرگیر / bergîr/:** ناو. ماری ژەهراوی حەستەم ☰ مار افعی

**بەرگیراو / bergîraw/:** ئاوەڵناو. بەربەست؛ قۆرغ ☰ ممنوع

**بەرگیرفان / bergîrfan/:** ناو. ئاسەری گیرفان ☰ آستر جیب

**بەرگیری / bergîrî/:** ☜ بەرگری

◘ **بەرگیری کردن:** پێش پێ گرتن: ١. پارێزگاری کردن ٢. بەر گرتن ☰ ١. دفاع کردن ٢. ممانعت کردن

**بەرگین / bergîn/:** ئاوەڵناو. ١. پێشینە؛ لە مێژ ٢. پێشوو؛ وەڵین ٣. بەروو؛ بەرەوە؛ لە پێشەوە ☰ ١. پیشین ٢. قبلی ٣. جلوی

**بەرگێ / bergê/:** ناو. بناگوێ ☰ بنا گوش

**بەرگێڵە / bergêle/:** ناو. هەیوانی بەردەم ئەشکەوت ☰ ایوان جلو غار

**بەرگێو / bergêw/:** ناو. لەمپەر؛ بەرهەڵست ☰ مانع

**بەرلک / berlik/:** ☜ بەرلیک

**بەرلۆغە / berloğe/:** ناو. بەرچەنە؛ بەرچێلە ☰ غبغب

**بەرلوزەو / berlûzew/:** ☜ بەرلوزەوە

**بەرلووزەوە / berlûzewe/:** ناو. بەرلووزەو؛ چۆلەکەچۆمە؛ سینگسپیلکە؛ مەلێکی جەستە ١٧ سانتیمیترییە، کلکی قولە و زۆر بە قیتی ڕایدەگرێ؛ پەڕ و باڵی قاوەیی ئاماڵ ڕەشە و لە سەر بەردەقیتەی ئاوچۆم هەڵدەنیشێ و سەر و کلکی دەجووڵێنێ، لە ژێر ڕووەزی ئاو، هەڵدێر و پرد و کەنار ڕووباران هێلانە دەکا ☰ زیرآبروک

**بەرلیک / berlîk/:** ناو. بەرلیکن؛ بەرلیکە؛ بەروانکەی منداڵ ☰ پیشبند بچه

**بەرلیکن / berlîkin/:** ☜ بەرلیك

**بەرلیکە / berlîke/:** ☜ بەرلیك

**بەرڵبێنە / berilbêne/:** ☜ بەرەڵبێتە

**بەرم / ber(i)m/:** ناو. قاژ؛ برۆ؛ خەتەمووی بان چاو ☰ ابرو

**بەرما / berma/:** ناو. بەرماو؛ بەرماوە؛ ئەوەی لە خواردن بمێنێتەوە ☰ پسمانده

**بەرماخ / bermax/:** ناو. بارماخ؛ بەرماغ؛ پەرە جگەرەی قامیش؛ جۆرێ پەڕەسیغاری لوولەکراو کە تووتنی تێ دەکەن ☰ کاغذ سیگار لوله شده

**بەرماغ** / bermağ/: ☜ **بەرماخ**

**بەرمالووسکە** / bermalûske/: ناو. پـڕ و پووشـی خوار مالووسکە لە خـەرمانی دەغڵـدا ≡ خاشـاک پایین ماسولەی خرمن

**بەرمالی** / bermalî/: ناو. کچی کارەکەر ≡ کنیز

**بەرماڵ** / bermał/: ناو. ۱. جانماز؛ جارماز؛ دوگرد؛ دووگـرد؛ شـەملک؛ چالـک؛ مازڵـۆخ؛ سـوجادە؛ ڕایەخێ کە نوێژی لە سەر دەکەن ‹مەیگێڕ وەرە! بەرماڵ و جبەی دەفرۆشم/ ڕیشم لـە گرێـو دەنـێم و شەی دەفرۆشم «هەژار، *چوارینـەکانی خـەییام*»› ۲. بناوانی ماڵ ۳. باگێـڕەوەی تـاوڵ؛ پارچـەیێ لـە کاتی هاتنی بای بەهێزدا بـە سـەر ڕەشماڵـییەوە دەگرن تا با زۆر کاری لـێ نـەکا ٤. بـەر دەرکـی خانوو ‹بەرماڵی سووره زاڵم و بەر ماڵەکەیشی سوور/ ڕیشـەی بـە تیغـی ئـاگر و سـووتانە موسـتەحەق «شـەریف»› ≡ ۱. سـجادە ۲. خانـەدار ۳. پارچـەی محکمی کە هنگام طوفان بر چادر زنند ۴. دمِ در

⊡ **بەرماڵ لە سەر ناو گەڕان**:*[مەجاز]* ۱. زۆر بۆ نوێژ خوێندن شـێلگیر بـوون ۲. زۆر پـاک و پـیرۆز بوون ≡ ۱. بسیار نمازخوان بودن ۲. بسیار مقـدس بودن

**بەرماڵک** / bermałik/: نـاو. ۱. جاجم ۲. مەوج ۳. بەروانکە؛ بەرهەڵبێنە ≡ ۱. جاجیم ۲. رختخواب‌پیچ ۳. پیشبند

**بەرماڵـە** / bermałe/: نـاو. ۱. بنـاوانی مـاڵ ۲. ژێرماڵە؛ پاشماڵە؛ ماڵـەهەژارێ کـە خزمـەتکاری ماڵێکە و جێگەیان داوەتێ ≡ ۱. کدبانوی خانـه ۲. خدمتکار مُقیم

**بەرماڵی** / bermałî/: ناو. کـار و پیشـەی بنـاوانی کردن لە ماڵ ≡ خانەداری

**بـەرمامک** / bermamik/: نـاو. دەمامـک؛ ماسـکە؛ ماسـک: ۱. ڕووبەنـد؛ ڕووبەنـە؛ پێچـە؛ پەچـە ‹دولبـەرم بـەرمامکی دابـوو لـە بـەر ئێشـی ددان/ وا دەزانن ڕوومەتیم ئەمشەو لە خەودا گەستووە «حاجی قـادر»› ۲. ئـەوەی دەم و لـووتی پـێ دەگـرن، کۆئەندامی هەناسەدان بپارێزێت ۳. کەرەسـتەیێ کاتی کارکردن دەموچاو لە گـەزن دەپـارێزێ ٤. ئەوەی کۆسـتە ڕووی پـێ دەگـرێ و خـۆی پـێ دەگۆڕێ ≡ ۱تا۴. ماسک

**بەرماو** / bermaw/: ☜ **بەرما**

**بەرماوخۆر** / bermawxor/: ☜ **بەرماوەخۆر**

**بەرماوە** / bermawe/: ☜ **بەرما**

**بەرماوەخۆر** / bermawexor/: نـاو. بـەرماوخۆر: ۱. پاشخوان‌خۆر ۲. *[کینایە]* نۆکەر ≡ ۱. پسماندەخور ۲. نوکر

**بەرمل** / bermil/: نـاو. گـەروو؛ باریکـەڕێی نێـوان زارک و سکی هەر شتێک ≡ هرچیز گلومانند

**بـەرملی** / berm(i)lî/: نـاو. بەروانکـە؛ بـەروان ≡ پیشبند بچە

**بەرمنـەت** / berm(i)net/: ناو‌ەڵـناو. منـەتبار؛ چاکەلەسەر؛ مەمنوون ≡ مِنّتدار

**بەرموسڵدان** / bermusiłdan/: نـاو. بانەگا؛ بەرگەدە؛ زارگا ≡ شرمگاه؛ زهار

**بەرموسوڵدان** / bermusułdan/: نـاو. ژێرمێزەڵدان؛ سەر بانەگا ≡ پایین مثانه

**بەرموور** / bermûr/: نـاو. گەردانە لە مت و مـووروو ≡ گردنبند از جنس مُهره

**بەرموورە** / bermûre/: ناو. ملوانکە ≡ گردنبند

**بەرمەجێڵ** / bermecêł/: نـاو. چەپـەر؛ دەرگـا و دیواری لە شووڵک ≡ دیواری از ترکـه کـه بـر دور حصار و باغ و قلعه و امثال آن کشند

**بەرمەشکە** / bermeşke/: نـاو. کـێ‌مەشـک؛ بەرەمەشکە ≡ کرەی یک‌بار مشک زدن

**بەرمەمکان** / bermemkan/: ناو‌ەڵناو. بەرمەمکانـە؛ بەرمەمکە؛ شیرەخۆرە ≡ شیرخوار

**بەرمەمکانە** / bermemkane/: ☜ **بەرمەمکان**

**بەرمەمکە** / bermemke/: ☜ **بەرمەمکان**

⊡ **بەرمەمکەوە بوون**: خاوەن منالی بەرمەمکە بوون ▪ بچەی شیرخوارە داشتن

**بەرمەیتاوی** / bermeytawî/: ناو. بەرهەیوان ▪ تراس

**بەرمیت** / bermît/: ناو. مۆم؛ شانەی هەنگوین ▪ موم

**بەرمیز** / bermîz/: ناو. کەمێڵە ▪ گال

**بەرمیل** / bermîl/: ناو. بوشکە؛ بۆشکە؛ بووشکە؛ دەرم؛ کۆس: ۱. داریل؛ دەفری گەورەی دارین بۆ تراو؛ کووپەی دارینی سەرگیراو ‹ئەزانم بۆچی من بانگ کراوم/ حەمالی دار و بەرمیلە ئاوم! «قانع»› ۲. دەفری هەراو لە کانزا بۆ تراو تێکردن ▪ ۱. چلیک ۲. بُشکە

**بەرمێشک** / bermêşk/: ناو. جۆرێ قەزوان ▪ نوعی چاتلانقوش

**بەرمێو** / bermêw/: ناو. پەڵکەمێو؛ ئاپراخ؛ گەڵامێو ▪ برگ مو

**بەرناترە** / bernat(i)re/: ناو. شادە؛ ناترە؛ داری سنووری کا و گەنم ▪ چوب فاصل کاه و گندم در خرمن

**بەرناخ** / bernax/: ناوەڵناو. فێڵباز؛ کەلەکباز ▪ حقّەباز

**بەرناس** / bernas/: ناوەڵناو. بەناوبانگ؛ ناودار؛ ناسکری ▪ مشهور

**بەرناڤ** / bernav/: ناو. ۱. لەقەم؛ لەقەب؛ نازناوێ کە پێش ناوی سەرەکی دێ (وەک: مامۆستا، سەید، شێخ، حاجی، دوکتور و ...) ۲. هەوەڵی شیو و دۆڵ ▪ ۱. لقب ۲. ابتدای درّە

⊡ **بەرناڤ دان**: ئامێتە کردن؛ تێکەڵاو کردن ▪ مخلوط کردن

**بەرنامە** / bername/: ناو. پێڕەو؛ پرۆگرام؛ ڕێنامە؛ ڕێچ؛ یاسا و ڕێنمایی بۆ جێبەجێ کردنی کار ▪ برنامە

⊡ **بەرنامە چنین**: ☜ **بەرنامە داڕشتن**

**بەرنامە داڕشتن**: بەرنامە چنین؛ بەرنامە ڕژاندن؛ تەگبیر و ڕا بۆ دۆزینەوە و گەیشتن بە مەبەستێکی دیاریکراو ▪ برنامەریزی کردن

**بەرنامە ڕژاندن**: ☜ **بەرنامە داڕشتن**

**بەرنامەداڕێژ** / bernamedařêj/: ناو. ئەو کەسەی کاری داڕشتنی بەرنامەیە ▪ برنامەریز

**بەرنامەداڕێژی** / bernamedařêjî/: ناو. بەرنامەڕێژی؛ کار و ڕەوتی بەرنامە داڕشتن ▪ برنامەریزی

**بەرنامەڕێژی** / bernameřêjî/: ☜ **بەرنامەداڕێژی**

**بەرنامەساز** / bernamesaz/: ناو. ئەو کەسەی بەرنامەیەکی ڕادیۆیی یان تەلەڤیزیونی دروست دەکا. هەروەها: **بەرنامەسازی** ▪ برنامەساز

**بەرنامەنوسی** / bernamenusî/: ناو. کار و ڕەوتی نووسینەوەی پلە بە پلەی کارێکی تایبەت بۆ ڕەوتانەیەک. هەروەها: **بەرنامەنووس** ▪ برنامەنویسی

**بەرناوک** / bernawik/: ☜ **بەرکەمەر ـ۲**

**بەرندە** / berinde/: ناوەڵناو. بەرننە: ۱. سەرکەوتوو ۲. خەڵاتبەر ▪ ۱و۲. برندە

**بەرندێر** / berindêr/: ☜ **بەردیل ـ۲**

**بەرننە** / berinne/: ☜ **بەرندە**

**بەرنوێژ** / bern(i)wêj/: ناو. پێش‌نوێژ؛ ئیمامی جەماعەت. هەروەها: **بەرنوێژی** ▪ پیشنماز

**بەرنەدەر** / berneder/: ناوەڵناو. سەهر؛ بێبەر ▪ بی‌ثمر

**بەرنەگیراو** / bernegîraw/: ☜ **بەربەرەڵا**

**بەرنیا** / bern(i)ya/: ناو. بەرنیان؛ دەمەزەردە (زیاتر بۆ گاسنە) ▪ تعمیر گاوآهن و داس

**بەرنیان** / bern(i)yan/: ☜ **بەرنیا**

**بەرنیخ** / bernîx/: ناو. بەرهەڵێخ؛ دیواری

پارێزەری دیواری درزاوی 🇮🇷 دیواربست

**بەرنیر / bernîr/**: ناوەڵناو. ١. نیر لە سەر مل (گا) ٢. وەختی جووت کردن هاتوو (جوانەگا) 🇮🇷 ١. شخم‌زن (گاو) ٢. مُهیای شخم‌زنی (گاو جوان)

**بەرنیسکێ / bernîskê/**: ناو. هەنیسک؛ ئانیسک 🇮🇷 هق هق گریه

**بەروا / berwa/**: ☜ بەرۆك

**بەروار / berwar/**: ناو. ١. بەروال؛ گەوە؛ ناوقەدی کێو ٢. ئەنازەی پانایی زەوی ٣. (ا) مێژووی مانگ و ساڵ 🇮🇷 ١. کمر کوه ٢. مساحت ٣. تاریخ

**بەروارک / berwark/**: ناو. قەرتاڵە 🇮🇷 سبد کوچک

**بەرواز / berwaz/**: ناوەڵناو. تایبەتمەندی شوێنێ کە بەرجەوەندی پێشەوەی هەراوە 🇮🇷 جلوباز

**بەرواژی / berwajî/**: ☜ بەراوەژو

**بەروال / berwal/**: ☜ بەروار ـ١

**بەروان / berwan/**: ☜ بەروانکە

**بەروانک / berwanik/**: ☜ بەروانکە

**بەروانکە / berwanke/**: ناو. بەروان؛ بەروانک؛ بەروانە؛ بەرڤانک؛ بەرڤانەک: ١. بەرهەڵبێنە؛ بەرەڵبێنە؛ بەرەوپێل؛ بەرانپێل؛ بەرانپێچ؛ بەربێنک؛ بەرکۆش؛ وەربانە؛ وەربەن؛ وەرینک؛ وەرزەنەک؛ سینگ و کۆش‌داپۆشی وەختی کار ٢. بەرلیک؛ بەرلک؛ بەرملی؛ بەروانکەی تایبەتی نان خواردن و لکی منداڵان 🇮🇷 ١. پیشبند کار ٢. پیشبند بچه

**بەروانە / berwane/**: ☜ بەروانکە

**بەروبوخچە / ber û buxçe/**: ناو. جلک و کەل‌وپەلی تایبەتی ژن 🇮🇷 بُخچه و وسایل مخصوص زنان

**بەروبۆ / ber û bo/**: ناو. ١. بەروبوو؛ بەرهەم؛ بەهرەی زەمین؛ داهاتی زەوی ‹ئەمساڵ وا دیارە بەروبۆ باش بێ› ٢. ڕۆژگار؛ ماوە و مەودا ٣. بەروبووم؛ وڵات 🇮🇷 ١. بهره‌ی زمین ٢. مدت ٣. وطن

**بەروبوو / ber û bû/**: ☜ بەروبۆ ـ١

**بەروبووم / ber û bûm/**: ☜ بەروبۆ ـ٣

**بەر و بەرئاوسێ / ber û ber'awsê/**: ناو. دەر و دەراوسێ؛ هاوسا و بەراوسا ‹لەویا جیا ئەبنۆ ئەچنۆ ماڵ خۆیان/ بەر و بەرئاوسێ ئەڕوانن بۆیان «قانع»› 🇮🇷 در و همسایه

**بەروبێشکە / ber û bêşke/**: ناو. لانک بە کەل‌وپەلەوە؛ بێشکە و ئەسپابی بێشکە 🇮🇷 گهواره و وسایل آن

**بەروپشت / ber û pişt/**: ناو. ١. پاش و پێش؛ بەردەم و دوا ٢. /کینایە/ دایک و باوک ‹ئەو کابرایە هاوماڵی ئێمەمانان نییە، بەروپشت ئەتلەسە› (واتا: دایک و بابی سەید یان ئاغان) 🇮🇷 ١. عقب و جلو ٢. پدر و مادر

**بەرودوا[1] / ber û d(i)wa/**: ناو. بەرەودوا: ١. یەک لە دووی یەک؛ دۆخی بە دووی یەکا هاتن ٢. بۆ پێش و بۆ دواوە ‹بەلەمەکە هەر بەرودوای دەکرد› 🇮🇷 ١. توالی و تسلسل ٢. عقب و جلو

**بەرودوا[2]**: ناوەڵناو. بەرەودوا؛ جێ‌بەجێ؛ جێ‌گۆڕاو ‹ئەم چەند ڕستەیە بەرودوان› 🇮🇷 پس و پیش

**بەرودوا[3]**: ناوەڵکار. بەرەودوا: ١. بەرەوپاش؛ ڕوو بە دواوە ‹ماشینەکە هەروا بەرودوا دەچوو!› ٢. بە پێچەوانە ‹پانتۆڵەی بەرودوا لە پێ کردا› ٣. جێگە وە جێگە ‹داستانەکەی هەموو بەرودوا دەگێڕایەوە!› 🇮🇷 ١. عقب ـ عقب ٢. پشت‌ورو ٣. جابه‌جا

**بەروەج / berwec/**: ناو. ١. پۆلا؛ ئاسنێ کە تفەنگی لێ دروست دەکەن ٢. تفەنگ 🇮🇷 ١. پولاد ٢. تفنگ

**بەروەستا / berwesta/**: ناو. شاگردی سنعاتکار؛ بەردەستی پیشەساز 🇮🇷 شاگرد کارگاه

**بەروەسێل / berwesêl/**: ناو. ١. ناوگۆڕک؛ تفک؛ کوانوو ٢. بەربەسێل؛ خواردنێکی کوردەوارییە زۆرتر لە گۆشتی گیسک و ماست چێ دەبێ 🇮🇷

١. آتشدان ٢. آش گوشت و ماست

**بەروەن** / berwen/: ☜ **بەربەند**

**بەروێ** / berwê/: ☜ **بەرۆك**

**بەرۆ** / bero/: ☜ **بەرۆك**

**بەرۆچكە** / beroçke/: ناو. خـۆرووەزان؛ بـەر ڕۆژ؛ بەڕۆژ ⇐ آفتابگير

**بەرۆش** / beroş/: ناو. بـرۆش؛ قـازان؛ مەنجـەڵ؛ قەزان؛ ديزەی لە مس ⇐ ديگ مسی

**بەرۆشساز** / beroşsaz/: ناو. مسگەر؛ قـەزانچی ⇐ مسگر

**بەرۆڤاژی** / berovajî/: ئاوەڵـناو. بـەراوەژوو؛ بەروپشت ⇐ واژگون

**بەرۆك** / berok/: ناو. بـەرەک؛ بـەرێک؛ پێسـير؛ بەروو؛ بەرۆ؛ بەروێ؛ بەروا؛ بەر ئێخە؛ يەخە؛ ياخە؛ ئێخە؛ يەقـە؛ مليـوان؛ ملشـۆ؛ بـەركۆژە؛ قـەرپک؛ وەروەرە؛ كۆژە؛ گومی؛ قەلان؛ قەمت؛ زی؛ پستوو؛ سوكر؛ خڕ؛ ئەو بەشە لە جـل كـە سەرسـينگ و دەوری مل دەگرێ، بەتايبەت پێشەوەی ‹ئـاوری شان و بەرۆكی خۆم ئـەدەم شـەيدا ئـەبم/ چـون بـە ئەشكی خوێنی جەرگم قرمز و گوڵناريیە «قانع»› ⇐ گريبان

⊡ **بەرۆك بەردان**: دەست لـە ياخـە كردنـەوە؛ لـە كۆڵ كەوتن؛ دەڤـژێ بـەردان ⇐ گريبـان رهـا كردن

**بەرۆك پێ گرتن**: *[كنايه]* لـێ ڕاسـت بوونـەوە؛ بەرهەڵست بوون ⇐ گريبان گرفتن

**بەرۆك دادرين**: يەخە دريـن لـە دەرد و خـەمان ‹لە دەوری تۆ منيش با هەر وەكوو گـول/ بـەرۆكم دادرِم تا سەر لـە داخـت «حەمـدی»› ⇐ گريبـان چاک كردن

**بـەرۆك گـرتن**: ئەشقەڵــە پــێ كــردن؛ شــەڕ پێفرۆشتن؛ گەڕ تێهاڵاندن ⇐ گريبان گرفتن

**بەروو**[١] / berû/: ناو. بەرۆک؛ يەخە؛ پێسير؛ دادڕاوی يەخە ⇐ گريبان

**بەروو**[٢]: ئاوەڵناو. پێشين؛ لەمێژ ‹ڕۆژگاری بـەروو› ⇐ پيشين

**بەرووش** / berûş/: ناو. بەشـێكە ئاشـێر دەيـدا بـە ئاشەوان ⇐ سهم آسيابان از آسياب

**بەروولە** / berûle/: ناو. ١. بەڕۆڵـە؛ خـەياری تـازە گووراوی بەقەد قامک ٢. دارۆكێكە دە ناو پاشبارە و دەستەندوودا ⇐ ١. خيار نـوبر ريـز ٢. چـوبکی در خيش

**بەرە**[١] / bere/: ناو. ١. دەستەيەک لە هەرچی كـە سەر بە سەردەمێكن ‹بەرەی تازە وەسەركەوتوو، وە خۆ كەوتن ... «هەژار، *هەنبانەبۆرينـە*»› ٢. ڕەگـەز؛ ڕەچەڵەک ‹بەرەی مـرۆڤ› ٣. تـيرە؛ تايفـە ‹دوو بەرەی جاف و گۆران› ٤. هەر يەكە لە دوو لايەنی شەڕ لە شەڕگەدا ‹ئەوڕۆ بەرەكانی شەڕ ئـارام بـوو› ٥. *[راميارى]* كۆمەڵێكی يەک‌گرتوو بە بير و دۆزی جياواز بەڵام ئامـانجێكی هاوبەشـەوە كـە دژ بـە شتێک هەڵوێست دەگرن ‹بەرەی دژ بە فاشيست› ٦. *[مجاز]* تاقمێک كە ئەنـدامانی بـۆ ئامـانجێكی گشتی هەوڵ دەدەن ‹بەرەی دۆست؛ بەرەی نەيار› ٧. سينەبەندی ئەسپ كە بە تەنگە زينەوەيـە ٨. دەرگا؛ درگا ٩. ڕەوتی بـەس كـردنی بـاران ١٠. بەهرە؛ داهات ١١. مەودای نێوان شە و جـۆلا لـە كاتی بووزوو تەنيندا ١٢. خشـت‌وخـاڵ ١٣. لـەو نەخۆشيانەی مـەڕ دەيگـرێ و ژانی پـێ دەكـا و گوانی ڕەق دەكا ⇐ ١. نسـل ٢. نـژاد ٣. عشـيره ٤. جبهەی جنگ ٥. جبهەی سياسی ٦ جبهەی مردمـی ٧. سينەبند اسب ٨. درب ٩. حالت بند آمدن باران ١٠. ثمـر؛ بهـره ١١. فاصـلەی بـين بافنـده تـا دفـه ١٢. آت‌وآشغال ١٣. از بيماری‌های دامی

⊡ **بەرە دان**: درێژە دان؛ زۆر كـردنی شـتێ؛ پـەرە پێدان ⇐ توسعه دادن

**بەرە**[٢]: ئامراز. ڕوو بە ⇐ به طرفِ

**بەرە ـ**[2]: پێشوشە. ۱. پێوەندیدار یان بەندیوار بە بەرەوە ‹بەرەزمانە؛ بەرەڕەت؛ بەرەژان› ۲. بەر لە ڕەوت یان کارێک ‹بەرەژەنە؛ بەرەجەژنانە؛ بەرەمۆ› ☰ ۱و۲. پیش ـ

**ـ بەرە**[4]: پاشەوشە. ـ بەر ‹تۆشەبەرە؛ دەنگەبەرە› ☰ ـ بَر

**بەرە**[5]: دەنگ. دەنگدانی گا بۆ گەڕانەوە لە سەری خەت ‹هۆرتە و بەرەی جووتیار، ئاوازی ئارانە «کاک ئەحمەد»› ☰ کلمەی صدا زدن گاو هنگام شخم

**بەرەبا / bereba**/: ئاوەڵناو. باگر؛ باپێچ؛ تایبەتمەندی شوێنێ کە با بیگرێ ☰ بادگیر

**بەرەباب / berebab**/: ناو. چین؛ دەڤل ☰ نسل

**بەرە ـ بەرە**[1] **/ bere bere**/: ئاوەڵکار. کەم ـ کەم؛ وردە ـ وردە؛ لە بەرێکەو ‹بەرە ـ بەرە دڵی ڕەش ئەبێ و جیاوازی نێوان باش و خراپ نازانێ «سوارە»› ☰ به تدریج

**بەرە ـ بەرە**[2]: دەنگ. وشەی بانگ کردن لە گا، کاتی جووت، بۆ هاتنەوەی بۆ سەرهێڵی جووتەکە ☰ واژەی هدایت گاو، هنگام شخم

**بەرەبەری / bereberî**/: ئامراز. بەراوبەری ☰ دمدمها

▣ **بەرەبەری بەیان**: نزیک بە ڕۆژ بوونەوە ☰ نزدیکی‌های صبح

**بەرەبەهار / berebehar**/: ناو. چەند ڕۆژی ئاخری زستان کە هەوا دەیگۆڕێ ‹بەرەبەهارێکی خۆش بوو› ☰ پیش‌بهار

**بەرەبەیان / berebeyan**/: ناو. بەربەیان؛ بووڵێڵەی بەیان؛ سپێدە؛ چەوسەر؛ هەوەڵی ڕۆژێ؛ تاریک و ڕوون؛ ئەلها؛ گوڵسوو؛ سفتەی سوو؛ سفێدە؛ شەوەکی زوو؛ کەڵەشێرە؛ نەماژی؛ نەماجی؛ کاتی کازیوە هەتا هەڵاتنی خۆر ‹خۆی کرد بە ژوورەکەما و چەشنی تەمی بەرەبەیان لە دەوری لەشم هالا «سوارە»› ☰ پگاه

**بەرەبێڵ / berebêl**/: ☜ بەربێڵ

**بەرەبێن / berebên**/: ناو. دەمبێن؛ زاربێن ☰ دهان‌بند

**بەرەپۆ / berepo**/: ☜ بەڕە

**بەرەتەشی / bereteşî**/: ناو. کوتەدارێکی پانکەڵەی گرۆڤەرە دە کلکەتەشی ڕادەکەن تا قورس بێ ☰ چوبک لنگر دوک

**بەرەتی / beretî**/: ئامراز. ۱. دەبێتە؛ دەکاتە ۲. باتی؛ جیاتی ☰ ۱. عبارت است از ۲. به جای

**بەرەج / berec**/: ناو. چارە؛ عیلاج ‹ئەم جۆرە دەرمانانە بەرەجی ئەو دەردە ناکەن› ☰ چاره

**بەرەجفت / berecift**/: ☜ بەربێڵ

**بەرەجۆ / bereco**/: ناو. ئەو چەن دێراوەی لە جۆگەیەکەوە ئاویان بۆ دەچێ ☰ چاله‌هایی از جالیز که از یک جوی آب می‌گیرند

**بەرەجووت / berecût**/: ☜ بەربێڵ

**بەرەجەژنان / berecejnan**/: ☜ بەرەجێژنان

**بەرەجێژنان / berecêjnan**/: ئاوەڵکار. بەرەجەژنان؛ ڕۆژانی نزیک لە جێژن ‹کراس و کەوات هەردوو کەتانە/ بینە بۆت بشۆم بەرەجێژنانە «فولکلۆر»› ☰ نزدیکی‌های عید

**بەرەچاوە / bereçawe**/: ناو. لایەکی کاریتەی میچ کە ڕیزە دەستەکی دەخرێتە سەر ☰ یک طرف شاه‌تیر سقف

**بەرەخوار / berexwar**/: ئاوەڵکار. ڕوو بە لای ژێروو ‹بەرەخوار بردمیان› ☰ رو به پایین

**بەرەخوارە / berexware**/: ناو. لێژایی؛ نشێو ‹ئەو بەرەخوارە زۆر نالەبارە› ☰ سرازیری

**بەرەخەر**[1] **/ berexer**/: ناو. جێ بار و بنەی کاروان ☰ جای اُطراق کاروان

**بەرەخەر**[2]: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی ماک و داکێک بێچوویان بە مردوویی دەبێ ☰ مُرده‌زا

**بەرەدار / beredar**/: ناو. مەودای نێوان دوو کاریتە لە میچی خانوودا ‹ژوورەکەیان سێ بەرەدارە› ☰ ردیف تیرک سقف

**بەرەڕەت / bereřet/**: ناو. ۱. مردە و زیندە؛ قووڵکە و چاڵی سەر ڕێبازی نەچیر ۲. چاڵۆکەیێ کە ڕاوکەر دەیکۆڵێ تا نێچیری تێکەوێ ☰ ۱. کمینگاه ۲. چالەی تلە

**بەرەڕیخ / bereřîx/**: ناو. دیوارۆکەی پشتیوانەی دیوار ☰ دیواربست

**بەرەزا / bereza/**: ناوەڵناو. یەکەمین بێچوو؛ یەکەم فرزەند ☰ اوّلین فرزند

**بەرەزام / berezam/**: ناو. سەتڵ‌وجەم؛ سینەپاڵوو؛ ساتوورجەم ☰ ذات‌الجنب

**بەرەزبانە / berez(i)bane/**: ناو. بەرەزمانە؛ بەرەزوانە؛ بەرەزوونە؛ ئاغزوونە؛ سێر؛ ئاڵقە و زمانەی کەوش و قایشی پشت و ... ☰ سگک

**بەرەزمانە / berez(i)mane/**: ☜ بەرەزبانە

**بەرەزوانە / berez(i)wane/**: ☜ بەرەزبانە

**بەرەزوونە / berezûne/**: ☜ بەرەزبانە

**بەرەزە / bereze/**: ناوەڵناو. تەرە؛ ئاوارە و سەرلێ شێواو ☰ آوارە

**بەرەزی / berezî/**: ناو. میوەی دڕکەزی؛ دڕووی پەرژین ☰ خار پرچین

**بەرەژان / berejan/**: ناو. ژانەدرۆزنە؛ ژان لێ هاتنی زگ‌پڕ بەر لە وەختی ژانی زان. هەروەها: **بەرەژان کردن؛ بەرەژان گرتن** ☰ درد کاذب پیش از زایمان

**بەرەژوور[1] / berejûr/**: ناو. ڕووەو بلندی ☰ سربالایی

**بەرەژوور[2]**: ناوەڵناو. سەربەرەوژوور؛ بەرەوژوورایی ‹ئەم ڕێگە بەرەژووورە چۆن ببڕین؟› ☰ سربالایی

**بەرەژوور[3]**: ناوەڵکار. سەربەرەوژوور؛ سەرەوبان ‹بەرەژوور بیگرە با نەڕژێ!› ☰ سربالا

**بەرەژوورە / berejûre/**: ناو. هەوراز؛ ئەڤراز ‹ئەم بەرەژووورە ببڕین، تەواوە› ☰ سربالایی

**بەرەژە / bereje/**: ناو. جەوی؛ جیوەی گیا ☰ صمغ و انگم گیاه

**بەرەژەنە / berejene/**: ☜ بەرەمەشکە

**بەرەژێر[1] / berejêr/**: ناو. نشێو؛ سەرەوخوارکە ☰ سرازیری

**بەرەژێر[2]**: ناوەڵناو. نشێو؛ بەرەوخوار ‹ڕێگای بەرەژێر› ☰ سرازیری

**بەرەژێر[3]**: ناوەڵکار. سەرەوخوار؛ بەرەوخوار ‹بەرەژێر بۆی دەرچوو› ☰ سرازیر

**بەرەژێرە / berejêre/**: ناو. لێژ؛ لێژایی؛ سەربەرەژێر ☰ سرازیری

**بەرەس / beres/**: ناو. کۆتی؛ کرژی؛ بەڵەکی ☰ برص

**بەرەستی / berestî/**: ناو. بەردئەستێ؛ بەردی ئاگرپژێن ☰ سنگ آتشزنە

**بەرەسماق / beres(i)maq/**: ناو. ترشۆکە؛ سیچکە؛ ترشکە؛ ترشۆک ☰ تُرشَک

**بەرەشک / bereşk/**: ناو. گیایەکە ☰ گیاهی است

**بەرەشکۆن / bereşikon/**: ناو. بەردی گەورەی سێبەردار بۆ دانیشتن ☰ سنگ بزرگ سایەدار

**بەرەشۆ / bereşo/**: ☜ بەردەشۆ

**بەرەشۆر / bereşor/**: ☜ بەردەشۆ

**بەرەشۆرکە / bereşorke/**: ناو. جانەوەرێکە لە تیرەی قۆلانچە ☰ نوعی سوسک

**بەرەفتاو / bereftaw/**: ناو. گوڵەبەڕۆژە؛ ڕۆزام‌پەرێز؛ ڕۆژان‌پەرێز ☰ آفتابگردان

**بەرەڤاژی / berevajî/**: ناوەڵناو. بەراوەژوو؛ پێچەوانە ☰ وارونە

**بەرەڤان / berevan/**: ناو. ناوبژیکار؛ کەسێ کە دەبێتە مایەی ئاشت کردنەوەی دوو دژ. هەروەها: **بەرەڤانی کردن** ☰ میانجی

**بەرەڤانی / berevanî/**: ناو. بەرگری؛ بەریڤانی ☰ دفاع

**بەرەڤی / berevî/**: ناو. کۆڕ ☰ مجلس

**بەرەقانی / bereqanî/**: ☜ **بەرکانی ــ١**

**بەرەک / berek/**: ناو. ١. بەرۆک ٢. بەرەی زینی ئەسپ ٣. بەرۆکی کۆپان ٤. ئەستێرەی سیوەیل ☰ ١. گریبان ٢. سینەبند زین ٣. سینەبند پالان ۴. ستارەی سُهیل

▣ **بەرەک پێگرتن**: ☜ **بەرەك گرتن**

**بەرەک گرتن**: بەرەک پێ گرتن؛ دەستەویەخە بوون؛ ئێخە گرتن ‹بەرەکم گرت، کتێبەکەم لێ ساندەوە› ☰ یقه گرفتن

**بەرەکەت[1] / bereket/**: ناو. پیت؛ فست ‹لە تۆ هەرەکەت، لە خوا بەرەکەت «پەند»› ☰ برکت

▣ **بەرەکەت کردن**: ١. بە پیت بوون (ئەم دەستەواژە زۆرتر بە شێوەی نزا دەگوترێ) ‹ئەو مانگا چەن لەسەرخۆیە، بەرەکەت کا!› ٢. دۆشینی مەڕ و مالات ‹بەرەکەتت کرد؟› ☰ ١. مبارک بودن ٢. دوشیدن

**بەرەکەت[2]**: ئاوەڵناو. بەرەکەتدار؛ بەهرەدار؛ بەبەهرە ☰ دارای برکت

**بەرەکەت[3]**: سارستە. خوا بەرەکەتی کا؛ فراوانی تێ کەوێ؛ خودا بەهرەی تێ بخا؛ لە خودا بە زیاد بێ ☰ برکت!

**بەرەکەتدار / bereketdar/**: ☜ **بەرەکەت[2]**

**بەرەکەتی / bereketî/**: ئاوەڵناو. مێژۆ؛ هەژێ؛ لایەق ☰ شایسته

**بەرەگە / berege/**: ناو. ١. جێ گەڕاندنەوەی ئاو ٢. ڕێبازی نچیر کە ڕاوکەر پێشی دەگرن ☰ ١. برغاب ٢. گذرگاه شکار که شکارچی در آنجا کمین کند

**بەرەگەڵا / beregeła/**: ناو. پۆڕگێکی سوور و سپی کە لە گەڵای دار مازوو دەردەچێ ☰ ثمر برگ مازوج

**بەرەلێژە / berelêje/**: ☜ **بەرەولێژە**

**بەرەڵا / bereła/**: ئاوەڵناو. بەرهەڵدا؛ بەرەڵلا: ١. ڕەها؛ بەرەڵدا ‹پەنجەکانم بەرەڵا کرد/ بۆ ئەوەی شار و شارۆچکەی ئەم زەمانە بهەژێنن «شێرکۆ»› ٢. لات و بێکارە ‹ئینەت کەرەگا! مەلای نامەلا/ بێ ڕەحم و ئینساف، لێوەی بەرەڵا «مەلا حەسەنی دزلی»› ☰ ١. ول؛ یله ٢. لات

▣ **بەرەڵا بوون**: بەرەڵدا بوون؛ وێڵ بوون ☰ ول بودن

**بەرەڵا کردن**: بەرەڵدا کردن؛ وێڵ کردن ☰ ول کردن

**بەرەڵایی / berełayî/**: ناو. بەرهەڵدایی: ١. وێڵی؛ ڕەهایی ‹برا خۆ ئازادی بەرەڵایی نییە!› ٢. خوێڕیگەری؛ بەتاڵ پایی ☰ ١. بی‌بندوباری ٢. ولگردی

**بەرەڵبێن / berełbên/**: ناو. بەرماڵ؛ دوگرد ‹دیم کچێکی لەباری لادێیی/ بۆ نوێژ ڕادەخا بەرەڵبێنێ «هێمن»› ☰ جانماز

**بەرەڵبێنە / berełbêne/**: ناو. بەرهەڵبێنە؛ بەرڵبێنە؛ پێشبەند؛ بەروانکە؛ پارچەی داپۆشی کەمەر تا ئەژنۆ لە کاتی کاردا ☰ پیشبند کار

**بەرەڵدا / berełda/**: ☜ **بەرەڵا**

**بەرەڵداکراو / berełdak(i)raw/**: ئاوەڵناو. قزێ؛ ولکری ☰ رهاشده

**بەرەڵلا / berełła/**: ☜ **بەرەڵا**

**بەرەم / berem/**: ناو. هەمباری چەک ☰ انبار اسلحه

**بەرەماک / beremak/**: ناو. بێچووی بەرەڵدا دەگەڵ دایک کە بە ئازادی شیر دەمژێ و دایکی نادۆشن ☰ بچەی حیوانی که تمام شیر مادر را بە او بدهند

**بەرەماڵ / beremał/**: ناو. خانەدان؛ بنەماڵە؛ ماڵەگەورە؛ گەورەماڵ ☰ خاندان

**بەرەمۆ / beremo/**: ناو. بێچووی ئاژەڵ کە دەم لە گوان ناکاتەوە و بە زۆر دووری دەخەنەوە ☰

بچەی حیوانی کە بە زور از پستان مادر جدا می‌شود

**بەرەمۆم / beremom/**: ناو. بەرەمێو ≍ آشغال کندوی عسل

**بەرەمەشکانە / beremeşkane/**: ناو. ١. یەکەم کەرەمەشکەی ساڵ کە دەیبەخشنەوە ٢. ☜ بەرەمەشکە ≍ ١. اولین کرەی مشک سال کە آن را می‌بخشند ٢. ☜ بەرەمەشکە

**بەرەمەشکە / beremeşke/**: ناو. بەرەژەنە؛ بەرەمەشکانە؛ کەرەی جارێک مەشکە ژەندن ≍ کرەی یک بار مشک زدن

**بەرەمێو / beremêw/**: ☜ بەرەمۆم

**بەرەندک / berendik/**: ناو. پێشواز ≍ استقبال

**بەرەنسکێ / bereniskê/**: ناو. هەنیسک؛ بەرسینچکە ≍ سکسکەی گریە

**بەرەنگار / berengar/**: ↓

⊡ **بەرەنگار بوونەوە** ئاوقا بوونەوە؛ دەگژراچوون ‹بەرەنگار بوونەوەی تیرۆریسمی جیهانی› ≍ مقابلە کردن؛ در برابر ایستادن

**بەرەنگاری / berengarî/**: ناو. بەربەرەکانێ ‹شوورەی سەختی بەرەنگاری/ پاردەی وەختی فیداکاری «هێمن»› ≍ رویارویی؛ مُقابلە

⊡ **بەرەنگاری کردن** دەگژڕا چوون ≍ رویارو شدن

**بەرەنیا / beren(i)ya/**: ناو. بەیراز؛ کاری زرو کردنەوەی بەرداش ≍ عمل آجدار کردن سنگ آسیا

**بەرەنێسکێ / berenêskê/**: ناو. وەرنیسک؛ خرینگی؛ نزگەرەی گریان ≍ سکسکەی گریە

**بەرەو / berew/**: ئامراز. بۆ لای؛ بەر بە ‹دێم بەرەو هۆبە و هەواری باسەفا/ دێم بەرەو لادێ، بەرەو کانگای وەفا «هێمن»› ≍ سوی؛ بە سویِ

**بەرەواژ / berewaj/**: ئاوەڵناو. بەراوەژوو؛ واژی؛ پشت‌وروو ≍ وارونە

**بەرەواژی / berewajî/**: ☜ بەراوەژوو

**بەرەوان[1] / berewan/**: ناو. ناوبژیکەر ≍ میانجی

**بەرەوان[2]**: ئاوەڵناو. لایەنگر؛ هەوادار ≍ مدافع

**بەرەوانی / berewanî/**: ناو. ڕەوتی لایەنگری ≍ طرفداری

**بەرەوبڕ / berewbiř/**: ناو. پێشەبڕکێ؛ پێشەبڕکە؛ کاری ڕێ لێبڕین ≍ سبقت

⊡ **بەرەوبڕ دانەوە** ڕێ لێ گرتنەوە ‹دیتم هەڵات، گورجێ بەرەوبڕم داوە و گرتم› ≍ سر راه کسی را گرفتن

**بەرەوپاش / berewpaş/**: ئاوەڵکار. ڕوو بە دواوە؛ بەرەو دواوە ‹بەرەوپاش دەگەڕاوە› ≍ رو بە عقب

**بەرەوپشت / berewpişt/**: ئاوەڵکار. پێچەوانە ‹قاپەکەی بەرەوپشت داناوە› ≍ وارونە

**بەرەوپیر / berewpîr/**: ئاوەڵکار. بەرەوپیری؛ بەرەوپیل؛ بە پێشوازی؛ کاری بە پیرەوە چوون ‹مەیخانەپەرەست نەبووم و تووشت کردم/ بەو پیرییە بەرەوپیری ئەوینت بردم «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ≍ بە استقبال

⊡ **بەرەوپیر هاتن/ چوون** ☜ بەرەوپیری هاتن/ چوون

**بەرەوپیری / berewpîrî/**: ☜ بەرەوپیر

⊡ **بەرەوپیری هاتن/ چوون** بەرەوپیر چوون؛ چوونە پێشوازییەوە ‹جارێک قاو داکەوت خەلیفەی شێخ حەسەنی قەرەچێوانی بەڕێوەیە. لای وێڵەدەر ڕێویەک بەرەوپیری هاتووە! ... «هەژار، *چێشتی مجێور*»› ≍ بە استقبال رفتن

**بەرەوپیل / berewpîl/**: ☜ بەرەوپیر

**بەرەوپێڵ / berewpêł/**: ناو. بەرانبپێچ؛ بەرانپێڵ؛ بەروانکە؛ سەنگ و بەرداپۆشی وەختی کار ≍ پیشبند کار

**بەرەوخوار / berewx(i)war/**: ئاوەڵکار. نشێو؛ سەربەژێر ‹بە دۆڵەکەدا بەرەوخوار ڕۆیشتم› ≍ رو بە پایین

⊡ **بەرەوخوار کردنەوە** لارەوە کردنی دەفر و ... ≍

کج داشتن ظرف و ...

**بەرەوخوار بوونەوە** سەربەرەژێر چوون ▤ سرازیر رفتن

**بەرەوخوارکایی** / berewx(i)warkayî/: ☜ **بەرەوخوارکە**

**بەرەوخوارکە** / berewx(i)warke/: ناو/ ئاوەڵناو. بەرەوخوارە؛ بەرەوخوارکایی؛ سەربەرەوخوار ▤ سراشیبی

**بەرەوخوارە** / berewx(i)ware/: ☜ **بەرەوخوارکە**

**بەرەودوا** / berewd(i)wa/: ☜ **بەرودوا**

⊡ **بەرەودوا خستن** بەرەودوا کردن؛ پاش و پێش پێکردن ▤ پس و پیش کردن

**بەرەودوا کردن** ☜ **بەرەودوا خستن**

**بەرەودوا نان** بەرودوا نان؛ کەوتنە شوێن؛ ڕەدوو کەوتن ▤ تعقیب کردن

**بەرەوڕوو** / berewřû/: ناو. ڕووبەڕوو؛ ئیزبار. هەروەها: **بەرەوڕوو بوونەوە؛ بەرەوڕوو کردنەوە** ▤ روبرو

**بەرەوڕووی** / berewřûy/: ئامراز. بەرانبەر؛ بەربەڕووی ‹بەرەوڕووی من وەستا› ▤ مقابلِ

**بەرەوژوور** / berewjûr/: ئاوەڵکار. ڕوو بە بڵندی ‹هەروا بەرەوژوور برۆ تا دەگەیە سەر گردەکە› ▤ رو به بالا؛ سربالا

**بەرەوژوورایی** / berewjûrayî/: ☜ **بەرەوژوورکە**

**بەرەوژوورکایی** / berewjûrkayî/: ☜ **بەرەوژوورکە**

**بەرەوژوورکە**[1] / berewjûrke/: ناو. بەرەوژوورکایی؛ بەرەوژوورایی؛ هەورازی کەم ‹بەرەوژوورکەیەکی ئاستەمە› ▤ سربالایی

**بەرەوژوورکە**[2]: ئاوەڵناو. بەرەوژوورایی؛ بەرەوژوورکایی؛ سەربەرەوبان ‹ناتوانم ڕێی بەرەوژوورکە برۆم› ▤ سربالا

**بەرەوژوورە** / berewjûre/: ناو/ ئاوەڵناو. هەوراز ▤ سربالایی

**بەرەوژێر** / berewjêr/: ناو/ ئاوەڵناو. ڕووبەخوار؛ لێژ؛ نشێو ▤ رو به پایین؛ سرازیری

**بەرەوژێرکە** / berewjêrke/: ناو/ ئاوەڵناو. کەمێک نشێو ▤ سرازیری کم

**بەرەوژێرە** / berewjêre/: ناو/ ئاوەڵناو. نشێو؛ سەرەوخواری ▤ نشیب؛ سرازیری

**بەرەولا** / berewla/: ئاوەڵناو. قیچەڵقاچ؛ قیلەقاچ؛ خوار بڕدراو؛ خوارەوخوار ▤ اُریب؛ کج

**بەرەولێژ** / berewlêj/: ئاوەڵناو. ڕووەونشێو ▤ شیبدار

**بەرەولێژایی** / berewlêjayî/: ناو. نشێوی ▤ سرازیری

**بەرەولێژکە** / berewlêjke/: ناو. نشێوی ‹بەرەولێژکەدا بڕۆن!› ▤ سرازیری کم

**بەرەولێژە** / berewlêje/: ناو. بەرەلێژە ‹بەرەولێژەی بەر قەلا› ▤ سرازیری؛ سراشیبی

**بەرەوە**[1] / berewe/: ↓

⊡ **بەرەوە بوون** ☜ **بەر بوونەوە**

**بەرەوە**[2]: ئاوەڵکار. لە بەرا؛ لە بەردا؛ لە بەرەوە ‹دەستەیەک بەرەوە ڕۆیین و تاقمێک مانەوە› ▤ از پیش؛ پیشتر

**بەرەوە**[3]: ئامراز. لای پێشەوە ‹ئەوانەی بەرەوە› ▤ جلوی

**- بەرەوە**[4]: پاشەوشە. ـ وەبەر؛ ببەر ‹خەلاتبەرەوە› ▤ ـ بر؛ برنده

**بەرهاڤێژک** / berhavêjik/: ☜ **بەراڤێژک**

**بەرهۆستا** / berhosta/: ناو. شاگرد؛ بەردەست ▤ شاگرد

**بەرهوور** / berhûr/: ☜ **بەرکهوور**

**بەرهەست** / berhest/: ئاوەڵناو. ١. تایبەتمەندی ئەو شتەی هەستی پێ بکرێ ٢. دیار؛ بەرچاو ▤ ١و٢. ملموس

**بەرهەڤ** / berhev/: ئاوەڵناو. ١. ئامادە؛ تەیار ٢.

کۆم لە سەر یەک ☰ ١. آمادە ٢. بر هم انباشتە

**بەرهەڤکار / berhevkar/**: ناو. ١. ئامادەکەر ٢. کۆوەکەر ☰ ١. آمادەکنندە ٢. جمع‌کنندە

**بەرهەڤکری / berhevk(i)rî/**: ناو. مینەق؛ جڤات؛ کار و ڕەوتی کۆوە کردن و سامان دان ☰ بسیج

**بەرهەڵبێنە / berhełbêne/**: ☜ بەرەڵبێنە

**بەرهەڵدا / berhełda/**: ☜ بەرەڵا

**بەرهەڵداکراو / berhełdak(i)raw/**: ئاوەڵناو. بەردایی؛ دەرکراو؛ وە دەرنراو ☰ راندە شدە

**بەرهەڵدایی / berhełdayî/**: ☜ بەرەڵایی

**بەرهەڵست / berhełist/**: ناو. ١. دوژمن؛ دژ ‹دێم گراوی خۆم لە باوەش وەرگرم/ دێم نەهێڵم بەرهەڵست و بەرگرم «هێمن»› ٢. لەمپەر؛ کۆسپ ‹ئەم کارە بەرهەڵستی زۆرە، پێمان ناکرێ› ☰ ١. دشمن ٢. مانع

⊡ **بەرهەڵستی کەسێک/ شتێک بوون**: لە دژی کەس/ شتێک ڕاستەوە بوون ‹سوێندیان خواردووە بەرهەڵستی هەموو ڕێچارێک ببنەوە!› ☰ علیە کس/ چیزی قد علم کردن

**بەرهەڵستکار / berhełistkar/**: ئاوەڵناو. دژبەر؛ لە دژی کارێک ڕاوەستاو. هەروەها: **بەرهەڵستکاری** ☰ مُعارض

**بەرهەڵستی / berhełistî/**: ناو. بەرتەک؛ پێشبڕی؛ کاری لێ ڕابوون؛ دەربڕینی نارەزایەتی لە بارودۆخێک ☰ اعتراض

**بەرهەڵێخ / berhełêx/**: ناو. بەرەڕیخ؛ پشتیوانە؛ دیوارۆکەی بن دیواری شکست، بۆ ئەوەی نەتەپێ ☰ دیوار پشتیبان

**بەرهەم[1] / berhem/**: ناو. داهات: ١. دەسهات؛ دەسکەوتی کار و چالاکییەک ‹بەرهەمی کارخانە› ٢. بەهرە؛ بەروبووم؛ دەرامەت ‹لە بەدبەختیمە وا باغی دڵی من/ درەختی نایەتە بەرهەم، لە بەر غەم «عورفی»› ٣. ئاکام؛ ئەنجام ‹بەرهەمی دە ساڵ شەڕ› ☰ ١تا ٣. محصول

⊡ **بەرهەم هێنان**: ١. وە بەر هێنان؛ بەدیهێنان؛ هلبەراندن؛ وەش کەردەی ‹خۆمان دوینە و بوڕێشی خۆمان بەرهەم دێنین› ٢. ڕەنێو هێنان؛ بەخێو کردن؛ پێگەیاندن ☰ ١. تولید کردن ٢. پرورده کردن

**بەرهەم[2]**: پێرۆ. ← دەرهەم - بەرهەم

**بەرهەمگە / berhemge/**: ناو. کارخانە؛ شوێنێکی میکانیزە بۆ بەرهەم هێنانی کاڵا ☰ کارخانە

**بەرهەمهێنەر / berhemhêner/**: ناو. وەبەرهێنەر؛ چێکەر ☰ تولیدکنندە

**بەرهەنگ / berheng/**: ناو. هەناسەسواری؛ نەخۆشی تەنگەنەفەسی کە زیاتر پیر تووشی دەبن ☰ نفس‌تنگی

**بەرهەیوان / berheywan/**: ☜ بەرهێوان

**بەرهەیوانۆکە / berheywanoke/**: ناو. سڤیک ☰ تراس کوچک

**بەرهێرش / berhêriş/**: ئاوەڵناو. بەرتەک ☰ مورد هجوم

**بەرهێڤی / berhêvî/**: ئاوەڵناو. هیوادار؛ بەهومێد؛ بەئاوات ☰ آرزومند

**بەرهێن / berhên/**: ئاوەڵناو. بەردار؛ خاوەن میوە یان دەسهات ☰ بارور

**بەرهێوان / berhêwan/**: ناو. بەرهەیوان؛ بەرمەیتاوی؛ هەواڵە ☰ تراس

**بەری[1] / berî/**: ناو. ١. گیرفان؛ بەریک ٢. بەش ☰ ١. جیب ٢. سهم

**بەری[2]**: ئاوەڵناو. ١. دوور؛ بەدوور؛ پاک ٢. بەردار؛ بەرهێن؛ خاوەن میوە یان دەسهات ☰ ١. بری ٢. بارور

• **بەری[3]**: پاشەوشە. بردن ‹تەماوو وەشبەری ماکێشە سەیدی!/ دوای درد عاشق نیست دستور «سەیدی»› ☰ - بری

**بەریان / beryan/**: ناو. بواری ئاو یان با ‹بەریانی ئاو بگرە! بەریانی با بەردە!› گذرگاه آب یا باد

**بەریڤان / berîvan/**: ناو. بەرەڤان؛ ناوبژیکەر؛ ناوجی میانجی

**بەریڤانی / berîvanî/**: ناو. بەرەڤانی؛ کاری ناوبژی کردن؛ نێوان کردن میانجیگری

**بەریک / berîk/**: ناو. بەری؛ بێرک؛ گیرفان؛ کێمانی؛ کوورک جیب

**بەریگ / berîg/**: ناو. تیر؛ گوللە تیر؛ گلوله

**بەریما / berîma/**: ناو. بنچینەیی نژادی

**بەرین¹ / berîn/**: ناو. بەرۆک گریبان

**بەرین²**: ئاوەڵناو. ١. پان؛ هەراو ‹نازی شۆخێکی نازەنین/ دەمباتە بەهەشتی بەرین «هێمن»› ٢. پێشین؛ لەمێژینە ١. عریض ٢. پیشین

**بەرینایی / berînayî/**: ناو. پانایی؛ پانی؛ هەراوی فراخی

**بەرینجک / berîncik/**: ناو. داری لە ئەندازەی فەرش کە دە پشتی تەون دەخرێ چوبی در عرض دار قالی

**بەرینە / berîne/**: ئاوەڵناو. پێشینە قدیمی

**بەرینی / berînî/**: ناو. بەرینایی فراخی

**بەریوارە / berîware/**: ناو. دەمەوئێوارە دم غروب

**بەریوان / berîwan/**: ناو. ناوبژی؛ ناوبژیکەر؛ ناوجێکەر میانجی

**بەریەمێ / beryemê/**: ناو. کووزەڵە شاهی آبی

**بەرێ¹ / berê/**: ناو. کارمامز؛ بەچکەی ئاسک برّه‌آهو

**بەرێ²**: ئاوەڵناو. بەروو؛ پێشوو؛ لەوەو پێش ‹ڕۆژی بەرێ› قبلی

**بەرێ³**: دەنگ. بەڵێ آری

**بەرێک / berêk/**: ناو. بەرۆک گریبان

**بەڕ / beř/**: ناو. ١. زرعاتی تینوو ٢. بەڕە؛ گڵیم؛ پەلاس؛ لەی ٣. بەژ؛ وشکانی ١. کشتزار تشنه ٢. گلیم ٣. خشکی؛ بر

⊡ **بەڕی خۆ دەرکردن**: لە عۆدەی کاری خۆ هاتن ‹من لە تۆفانا بەڕی خۆم دەردەکەم/ وا مەزانە دامەنی خۆم تەڕ دەکەم «حاجی قادر»› گلیم خود را از آب بیرون کشیدن

**بەڕا¹ / beřa/**: ناو. بەرخ؛ وەرە برّه

**بەڕا²**: ئاوەڵناو. زانا و بەتەگبیر مُدبِّر

**بەڕا³**: ئاوەڵکار. [سووکەڵە] بەڕاستی براستی

**بەڕاس / beřas/**: ئاوەڵکار. ١. بەڕاستی ٢. لە ڕاستیدا؛ بەدروستی ١. براستی ٢. بدُرستی

**بەڕاست / beřast/**: ☜ بەڕاستی

**بەڕاستی / beřastî/**: ئاوەڵکار. بەڕاست؛ بەڕاسی؛ ڕاستی - ڕاستی ‹کە قامەتی بەدەر ئەخا، قیامەت ئاشکار ئەکا/ چ قامەتێ؟ بەڕاستی لە سەروی جویبار ئەکا «بێخود»› براستی

**بەڕاسی / beřasî/**: ☜ بەڕاستی

**بەڕاک / beřak/**: ناو. هەیوان؛ بەربێلایی؛ سەکۆی سەرداپۆشراو تراس

**بەڕانی / beřanî/**: ئاوەڵناو. بیانی؛ بێگانە؛ لاوەکی بیگانه

**بەڕاوێژ / beřawêj/**: ئاوەڵناو. خاوەن ڕا و تەگبیر ‹خەڵکێکی بەڕاوێژ و بەبیرن› باتدبیر

**بەڕبەڕی / beřbeřî/**: ناو. جۆرێ نانەکولێرەی درێژ و ئەستوور نان بربری

**بەڕدێن / beř(i)dên/**: ئاوەڵناو. ڕیشدار؛ ڕدێندار؛ ڕیشوو ریشو

**بەڕڕا / beřřa/**: ئاوەڵناو. تیژ؛ تێژ ‹هەرچەند گونەهکار گوناش فێشتەرەن/ تیغی عەفوی تۆ بەڕڕا و تێژتەرەن «سەیدی»› تیز

**بەڕزین / beřzîn/**: چاوگ. شالاو بۆ بردن؛ بە پەلە بۆ چوون با شتاب یورش بردن

**بەڕق / beřiq/**: ئاوەڵناو. ڕکوونی؛ قین لە دڵ؛ ڕک

لە سک ☰ کینەتوز

**بەرقەوە / beř(i)qewe/**: ئاوەڵکار. بە قینەوە ‹بەرقەوە تماشای کردم› ☰ کینەتوزانە

**بەرک / beřik/**: ئاوەڵناو. ئاژری؛ تووڕە ☰ خشمگین

**بەرمێن / beř(i)mên/**: ئاوەڵناو. باو؛ ڕووبازاڕی ☰ پررونق

**بەرواڵەت / beřiwałet/**: ئاوەڵکار. بە ڕواڵەتی؛ بە نما؛ لە ڕووی ڕواڵەتەوە ‹بەرواڵەت لە تۆی ئەکرد› ☰ بە ظاهر؛ ظاهراً

**بەرواڵەتی / beř(i)wałetî/**: ☜ بەرواڵەت

**بەرۆژ[1] / beřoj/**: ناو. ١. بەربەرۆچک؛ بەربەرۆچکە؛ شوێنی ڕووەو خۆر ٢. گوند یان مەزرای ڕووەو ڕۆژ ☰ ١. جای آفتابگیر ٢. روستا یا مزرعه‌ی آفتابگیر

**بەرۆژ[2]**: ئاوەڵناو. ڕووەو ڕۆژ؛ خۆرگیر ‹ماڵێکی بەرۆژ و یارێکی وەک ڕۆژ!› ☰ آفتابگیر

**بەرۆژ[3]**: ئاوەڵکار. ڕۆژانە ‹بەرۆژ ژان و بەژارەم دێنە پاڵێ/ بە شەو ئۆقرەم نییە ساتێک لە ماڵێ «هێمن»› ☰ روزانه

**بەرۆژوو / beřojû/**: ئاوەڵناو. بەرۆژی؛ ڕۆژگ؛ ڕۆژییەوان؛ ڕۆژگەوان؛ مانگرتوو لە خواردن لە ڕۆژدا، بەپێی فەرمانی شەرع. هەروەها: **بەرۆژوو بوون** ☰ روزه‌دار

**بەرۆژی / beřojî/**: ☜ بەرۆژوو

**بەرۆڵە / beřołe/**: ☜ بەڕووڵە -١

**بەروو[1] / beřû/**: ناو. بەلوو؛ بەڕی؛ بەلی؛ بەری: ١. نەرە؛ داربەڕوو؛ داربەڕوار؛ بەڕوودار؛ دارێکی لێڕیی تۆکمەیە بە بنی زۆر بە قەوەتەوە ‹... بەڕوو دێ بۆ لام/ ڕەگی خۆی ئەبەستێ بە ڕەگی قاچمەوە «شێرکۆ»› ٢. بەری داربەڕوو، کە دەنکێکی مەیلەو خورمایی بەقەد دانەبادامێک یان هێندێک گەورەترە و دەخورێ ☰ ١. درخت بلوط ٢. دانه‌ی بلوط

**بەروو[2]**: ئاوەڵناو. ١. بەڕێز و حورمەت ٢. بێشەرم و قسەڕەق ☰ ١. محترم ٢. پُررو

**بەروودار / beřûdar/**: ☜ بەڕوو[1]-١

**بەرووژە / beřûje/**: ناو. گوڵەبەڕۆژە؛ ڕۆژان‌پەرێز ☰ آفتابگردان

**بەروولە / beřûle/**: ☜ بەلووچکە

**بەرووڵە / beřûłe/**: ناو. دارێکە دەیکەنە نێو کونی لووتی کەڵ یان وشتردا بۆ ئارام کردنەوە و ڕاکێشانی ☰ مهار (گاو، شتر)

**بەرووەخاسە / beřûwexase/**: ناو. شەمبەلووت؛ شابەڕوو؛ کەستانە ☰ شاه‌بلوط

**بەرووی / beřûy/**: ناو. بیاوان؛ یاوان؛ بیابان ☰ بیابان

**بەرە / beře/**: ناو. بەڕ؛ بەر؛ وەڕ؛ بەرەپۆ؛ گلیمە؛ گلێم؛ گلیم؛ کلیم؛ مەڕت؛ مەرش؛ سیپاڵ؛ لەی؛ لی؛ هەپک؛ وەرچنی؛ ڕایەخێکی ئەستوورە لە تانی بەن و پۆی خوری، بە نەخش و نیگاری جۆراوجۆرەوە کە دارەتەونی بۆ هەڵدەخرێ و بە دەست دەچنرێ ‹... دەرگای ئاگرم لێ داخە! لە بەهەشت بەرەم بۆ ڕاخە، کەیف بکەم! «هەزار، *چوار نامیلکە*»› ☰ گلیم

⊡ **بەرە لە سەر هەتیو لادان**: /*کینایە*/ سوڕ و نهێنی ئاشکرا کردن ☰ افشا کردن

**بەرەی خۆ نەخستنە ژێر کەس**: ١. خۆ نەخستنە ژێر باری منەتی کەسێکەوە ٢. ڕێ بە کەسێک نەدان بۆ خاپاندن و ماڵ خواردن ☰ ١. زیر بار منّت کسی نرفتن ٢. اجازه‌ی سوء استفاده به کسی ندادن

**بە قەد بەرەی خۆ پا داکێشان**: ڕادەی خۆ زانین؛ لە ڕادەی خۆ دەرنەچوون ☰ حدّ خود را نگهداشتن

**بەرەحم / beřehm/**: ئاوەڵناو. ڕەحمین؛ دڵنەرم؛ خاوەن بەزەیی ‹زاتێکی وا بەرەحمە لە ڕۆژی شەفاعەتا/ هەرچی جەهەننەمی هەیە جەننەت‌نشین ئەکا «بێخود»› ☰ مهربان

**بەرەز / beřez/**: ☜ بەرەزا

**بەرەزا / beřeza/**: ناو. بەرەز؛ گیایەکی جوانە بە

کاوانــەوە دەڕوێ و وەک زولــف شــۆڕ دەبێتــەوە ‹پێش ئەوەی شنەی بەیانی/ زولفــی بــەڕەزا بیزێـوێ «هێمن»› 🇸🇦 گیاهی کوهستانی شبیه زُلف

**بەڕەژە** / beřeje/: ناو. گیایەکە بۆ دەرمانی منداڵان دەبێ 🇸🇦 گیاهی دارویی

**بەڕەڤان** / beřevan/: ☜ ناوبژی

**بەڕەکۆن** / beřekon/: ناو. پەڵاس؛ بەڕە 🇸🇦 پلاس

**بــەڕەنگوڕوو** / beřeng û řû/: ئاوەڵنـاو. وەڕەنــگ؛ تەڕوبەر؛ بەچەرخوچیامان 🇸🇦 خوش آبورنگ

**بەڕەواج** / beřewac/: ئاوەڵناو. باو؛ لەباو 🇸🇦 رایج

**بەڕی**[1] / beřî/: ☜ **بەڕوو**[1]

**بەڕی**[2]: ئاوەڵناو. بەڕوو؛ بەڕێز و قەدر 🇸🇦 مُحترم

**بەڕیدە** / beřîde/: ئاوەڵناو. ئاوارە 🇸🇦 آواره

**بەڕیز** / beřîz/: ئاوەڵکار. گلوو ـ گلوو؛ یەک لە پەنا یەک 🇸🇦 دانه ـ دانه

**بەڕیش** / beřîş/: ناو. جۆرێ نەخۆشی ئاژەڵــە 🇸🇦 از بیماری‌های دام

**بەڕینگاڵ** / beřîngał/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی پەزی تیسکدرێژ 🇸🇦 گوسفند پشم دراز

**بەڕیە** / beřye/: ناو. بیابان؛ بیڕوون 🇸🇦 بیابان

**بــەڕێ** / beřê/: ئاوەڵنـاو. ١. بــەجێ؛ ڕەوا ٢. ڕاواز؛ ڕوونیا؛ لە ڕۆیشتندا ‹ڕێبــواران بــەڕێوەن› 🇸🇦 ١. روا ٢. راهی

**بەڕێ**[1] / beřê/: ناو. ↓

⊡ **بــەڕێ کردن** ١. ناردن؛ هــەناردن؛ کــڵ کــردن ‹بەڕێ دەکەین پیرۆزبایی/ پەیمان بەستنی برایــی «هەژار، *بۆکوردستان*»› ٢. ڕوانە/ بەدرەقە کردن ‹میوانی کۆن بەڕێ ئەکەین و تــازە/ بــە پێکــەنین ئەگاتە بــەر دەروازە «گــۆران»› 🇸🇦 ١. فرســتادن ٢. بدرقه کردن

**بەڕێ کەوتن** ڕێ کــەوتن؛ کەفتنــە ڕێگــە ‹لــە شاخەوە/ بەڕێ کەوتووی هەناسەسوار «شــێرکۆ»› 🇸🇦 راه افتادن

**بەڕێوە بــردن** جێبەجێ کردن ‹پیاو دەبــێ کــاری خۆی باش بەڕێوە بەرێ «سوارە»› 🇸🇦 انجام دادن

**بەڕێ**[2]: ئاوەڵناو. ١. بەجێ؛ ڕەوا ٢. ڕاواز؛ ڕوونیا؛ لــە ڕۆیشتندا ‹ڕێبواران بەڕێوەن› 🇸🇦 ١. روا ٢. راهی

**بەڕێبەرایەتی**/ beřêberayetî/: ☜ **بەڕێوەبەرایەتی**

**بــەڕێز** / beřêz/: ئاوەڵـناو. ١. خۆشەویســت ‹لــە لای ئازادیخواز و کوردی دڵسۆز/ بەڕێزتر بۆ نەبێ ئــەورۆ لــە نەورۆز؟ «هێمن»› ٢. ڕێزدار 🇸🇦 ١. محبوب ٢. محترم

**بەڕێزی** / beřêzî/: ناو. ئاغاتی 🇸🇦 سَروری

**بەڕێکراو** / beřêk(i)raw/: ئاوەڵـناو. ڕاخراو؛ ڕوانــە؛ ڤەشاندی 🇸🇦 فرستاده

**بەڕێکەر** / beřêker/: نـاو. شانەر؛ سانەر؛ شــێنەر 🇸🇦 فرستنده

**بەڕێوبەر** / beřêwber/: ☜ **بەڕێوەبەر**

**بەڕێوبەرایــــــــــەتی** / beřêwberayetî/: ☜ **بەڕێوەبەرایەتی**

**بــەڕێ‌وجێ** / beřê w cê/: ئاوەڵـناو. ١. عاقڵانــە و پەســند ‹قســەیەکی بــەڕێ‌وجــێ بــە شــەنگەدارێک دەشبهێ، ڕەگــی قــایم داکوتــاوە و لقــی لــە تەشــقی ئاسمانــە «هــەژار، *قورئــان*»› ٢. لــە ئەســپابی میوانداریــدا ســاز و تــەیار 🇸🇦 ١. بجــا؛ عاقلانــه ٢. مُهیای پذیرایی

**بەڕێ‌وشوێن** / beřê w ş(i)wên/: ئاوەڵـناو. ١. لــە بواری کۆمەڵایەتیدا زانا ٢. تەکووز 🇸🇦 ١. آگـاه بـه امور اجتماعی ٢. مُرتب

**بەڕێوەبەر** / beřêweber/: ناو. بەڕێوبــەر؛ ڕێڤــەبەر؛ کارگێڕ؛ هەڵسووڕێن؛ ئەو کەســەی بــەڕێوەبردنی دامەزراوەیەکی لە ئەستۆدایە 🇸🇦 مُدیر

**بەڕێوەبەرایــــەتی** / beřêweberayetî/: نــــاو. بەڕێوبەرایــــەتی؛ بەڕێبەرایــــەتی؛ ڕێڤــــەبەری؛ کارگێڕی: ١. کار و ڕەوتی هەڵسووڕاندن ٢. کۆی ئەو کەسانەی کارێک هەڵدەســووڕێنن ٣. کــار و پیشــەی بەڕێوەبەر 🇸🇦 ١. هدایت ٢. هیئت مُــدیره ٣.

مدیریّت

**بەڕێوەبەری / beřêweberî/**: ناو. مشـــوورخۆری؛ کارگێڕی 🇮🇷 مُدیریّت

**بەز[1] / bez/**: ناو. پیو؛ پی؛ پیه ؛ پییە؛ پیڤ؛ دووگ؛ گوهن؛ پیم؛ وەز؛ بز؛ دینگ؛ زوهم؛ چەورایی ‹بە نۆش گیانت بێ/ بەز ناوشانت بێ! «فولکلۆر»› 🇮🇷 پیه

**• بەز[2]**: پاشەوشە. ۱. بـڕۆ؛ بـەزێن ‹لـە مەیـدان دیومـە نێسکەی ئەسـپی خۆشـبەز/ لەگـەڵ دەسـتوجلـیتی شۆڕەسواران «هێمن»› ۲. بەزیو؛ تێشکاو ‹نەبەز› ۳. مان؛ دابەز؛ مانەوە؛ وەسـتان؛ هێشـتنەوە؛ جـێگیر بوون ‹لەشکەربەز؛ ئوردووبـەز› 🇮🇷 ۱. ـ رَو؛ ـ تـاز ۲. شکستخورده ۳. توقف

**بەزا / beza/**: ئاوەڵناو. خۆشڕەو؛ خۆشبەز 🇮🇷 راهوار

**بەزات / bezat/**: ئاوەڵـناو. زاتـدار؛ ئـازا؛ نـەترس 🇮🇷 شُجاع

**بەزاج / bezac/**: نـاو. شـــووفاری و شـــەیتانی؛ دووزمانی 🇮🇷 سخنچینی

**بەزاجکەر / bezacker/**: ئاوەڵـناو. شووفار؛ دووزمان؛ شەیتانیکەر؛ نێوانتێکدەر 🇮🇷 دوبهمزن؛ سخنچین

**بەزاخ / bezax/**: ئاوەڵـناو. ۱. دووزمان؛ شـووفار ۲. بەکار؛ ئازا؛ کاری 🇮🇷 ۱. سخنچین ۲. کارا

**بەزاز / bezaz/**: ناو. کووتـاڵفـرۆش؛ گـەزفرۆش؛ پارچەفرۆش 🇮🇷 بزّاز

**بەزازی / bezazî/**: ناو. کووتـاڵفرۆشـی: ۱. کـاری پارچە فرۆشـی ۲. دووکـانی پارچەفرۆشـی 🇮🇷 ۱. شغل بزّازی ۲. مغازەی بزّازی

**بەزافتە / bezafte/**: ئاوەڵناو. بە هەیبەت و تووڕە لە هەمبەر ژن و منداڵ 🇮🇷 مردسالار

**بەزاڤیت / bezavît/**: ئاوەڵناو. ئیرادگر 🇮🇷 عیبجو

**بەزاکوون / bezakûn/**: ئاوەڵـناو. ۱. تونـــدوتیژ ۲. سـەختگر ۳. بەبـڕ ✱ هـەروەها: **بـەزاکوونی** 🇮🇷 ۱. چابک ۲. سختگیر؛ جدی ۳. قاطع

**بەزان / bezan/**: چاوگ. پەزان: ۱. بەزین؛ شکست خواردن ۲. غاردان؛ هەڕا کـردن ‹مـیر و مـەزن و گرەگرەی دەدیوانێ، بەنی و نۆکەری پاشخانی، ورد و درشت و گشت لە گشت، بـە غـار دەبەزنـە هـەواری، جێژوانی لاوان چۆڵ دەکەن «هەژار، *مـەم و زیـن*»› ۳. هاتنە خوار لە سواری 🇮🇷 ۱. شکست خـوردن ۲. دویدن ۳. پایین آمدن

**بەزاندن / bezandin/**: چـاوگ. تێـەڕ. //بەزانـدت؛ دەبەزێنی؛ ببەزێنە// بەزانن؛ پەزاندن: ۱. شکاندن؛ کۆڵ پێدان ‹بیتەزێنە بە پەلاماری توند/ ببەزێنە لە چیـا و شـار و گونـد «هـێمن»› ۲. غـار پێـدان؛ ڕا پێکردن ۳. تێپەڕاندن؛ لادان ‹... ئەم هاوارە تـەنیا هاوارێک نییە بۆ بلاوکردنەوەی فەسادی کۆمەلایـەتی و سنوور بەزاندنی داب و نەریت ... «جەبار سـابیر»› 🇮🇷 ۱. شکست دادن ۲. تازاندن ۳. زیر پا گذاشتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێتی: نەبەزاندن

**بەزانن / bezanin/**: ☜ **بەزاندن**

**بەزتن / beztin/**: چاوگ. ۱. دابەزین؛ داوەزین ۲. بار خستـنی کاروان و ... 🇮🇷 ۱. پایین آمدن ۲. اُتراق کردن کاروان

**بەزدار / bezdar/**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* قەڵەو 🇮🇷 چاق

**بەزدونـەک / bezdunek/**: ئاوەڵـناو. ترســـەنۆک؛ تەرسۆنەک؛ قزە 🇮🇷 ترسو

**بەزدۆک / bezdok/**: ناو. جێگای باز دان؛ پلیکـانی تایبەت لە تەختە بۆ خۆ هاویشتنە ناو ئەسـتێر 🇮🇷 دایو

**بەزدین / bezdîn/**: چاوگ. ۱. ترساندن ۲. ترسـان ۳. پسان 🇮🇷 ۱. ترساندن ۲. ترسیدن ۳. گُسستن

**بەزر[1] / bez(i)r/**: ناو. تۆم؛ تۆو؛ توو 🇮🇷 تخم گیاه؛ بذر

**بەزر[2]**: ☜ **بزر**

**بەزرگـەر / bezirger/**: نـاو. وەرزێـــر؛ فـــەلاح؛ جووتبەندە 🇮🇷 برزگر

**بەزرۆک / bezrok/**: نـاو. بـــزرۆک؛ وزدەزیپکـــەی لەش 🇮🇷 جوش ریز

**بەزرە / bezre/**: ☜ **بزر**

**بەزرەک / bezrek/**: ☜ **بەزەرەك**

**بەزرەونج / bezrewinc/**: ناو. گیایەکی زۆر بۆنخۆشە 🇮🇷 گیاهی خوشبو

**بەزگ / bezig/**: ئاوەڵناو. خەمبار؛ خەفەتبار 🇮🇷 غمگین

**بەزم / bezm/**: ناو. ١. ئاهەنگی شادی و خۆشی ‹دەف و تەمبوور و ساز و بەربەت و تار/ دەبێ ئەم بەزمە هەر بەم نەزمە بڕوا «شێخ ڕەزا»› ٢. ئاهەنگ؛ ڕێوڕەسم ‹ئاهەنگی زوڕنا و بەزمی هەڵپەڕکێ/ دەنگ‌ئەداتەوە هەتا ئەوپەڕ دێ «شەریف»› ٣. بەزم و ڕەزم؛ تەشریفات؛ داب و دەستوور ‹دا بەزم خوسرەو ـ شیرین وە هەم دا/ جام دا وە سەر جەم، جەم وەسەر جەم دا «مەولەوی»› ٤. شەڕ و کێشە و ناخۆشی ‹بەزمی ئەم ژن و شووە کۆتایی نەهات؟› ٥. بسات؛ بار و دۆخ (بەتایبەت ناخۆش) ‹دیسانەوە بەزمەکەی ساڵی پارە و ئاومان قت دەبێ› ٦. [مەجاز] تەشقەڵە و گەڕ ‹هەر ڕۆژێک بەزمێکی تازەی ساز دەکرد› 🇮🇷 ١. شادی ٢. مراسم جشن ٣. تشریفات ۴. دعوا و مُرافعه ۵. بساط ۶. بامبول

⊡ **بەزم بە سەردا هێنان:** [مەجاز] تووشی شەڕ و ناخۆشی کردن 🇮🇷 درگیر ماجرا کردن

**بەزم پێگرتن:** شەڕ و کێشە پێفرۆشتن 🇮🇷 گربه رقصاندن

**بەزم پێگێران:** ئاهەنگی شادی بە کەس یان شتێک بەڕێوە بردن 🇮🇷 بە وسیلەی کسی یا چیزی مجلس سوری را چرخاندن

**بەزم گێران:** بەڕێوەبردنی ئاهەنگی شادی و خۆشی ‹بەو بۆنەوە بەزمێکی خۆشیان گێڕا› 🇮🇷 مجلس سور به پا کردن

**بەزمان / bez(i)man/**: ئاوەڵناو. قەڵ؛ قسەزان 🇮🇷 سُخنور

**بەزمشک / bezmişk/**: ئاوەڵناو. زۆربلێ 🇮🇷 حرّاف

**بەزمگا / bezimga/**: ☜ **بەزمگە**

**بەزمگە / bezimge/**: ناو. بەزمگا؛ جێگەی شادی و ئاهەنگ ‹ئەو جا بەزمگەی کەس جێ نەڕەستە/ مەنزڵگەی سەیاد هەزاران خەستە «مەولەوی»› 🇮🇷 بزمگاه

**بەزمگێڕ / bezimgêř/**: ئاوەڵناو. ١. شاییگێڕ ٢. ئاهەنگ‌گێڕ؛ کۆڕگێڕ؛ خاوەن توانایی خۆش کردنی کۆڕی بەزم 🇮🇷 ١. مُطرب ٢. بزم‌آرا

**بەزموڕەزم / bezmûřezm/**: ناو. ١. شایی و داوەت ٢. داب و دەستوور؛ بارگرانی؛ تەشریفات ‹ژن هێنانیش لای ئێمە، بەزم و ڕەزمی زۆرە› 🇮🇷 ١. مراسم عروسی و شادی ٢. تشریفات

**بەزمەتە[١] / bezmete/**: ناو. بزمەتە؛ بزماتە؛ قەتماغە؛ پەترۆک؛ قرتماغەی سەر برین ‹بەزمەتەی زامی دڵم ئەمجارە وا مەحکەم بووە/ گەر بە شمشێری بڕۆت بکرێ لەباتی نەرمەساو «قانع»› 🇮🇷 سَلّه

**بەزمەتە[٢]**: ئاوەڵناو. ئامادەی بەزم گرتن و شایی کردن 🇮🇷 بزمی

**بەزمی / bezmî/**: ئاوەڵناو. ئامادەی بەزم گرتن و شایی کردن 🇮🇷 بزمی

**بەزمیگ / bezmîg/**: ناو. بزنمژە 🇮🇷 بُزمجه

**بەزنجیرە / bezincîre/**: ئاوەڵکار. زنجیرلەمە؛ یەک بە شوێن یەکا 🇮🇷 زنجیروار؛ یکی بعد از دیگری

**بەزۆک / bezok/**: ئاوەڵناو. خۆشبەز 🇮🇷 راهوار

**بەزە / beze/**: ناو. ١. بەزەیی؛ دلۆڤانی؛ ڕوحم؛ دڵنەرمی ٢. گوناح؛ هەڵە 🇮🇷 ١. رحم ٢. گناه

**بەزەتاو / bezetaw/**: ناو. پیوی لە سەر ئاگر گەرمکراو بۆ دەرمانی قەڵشتی دەست و پێ 🇮🇷 پیه تفیده برای ترک دست و پا

**بەزەرەک / bezerek/**: ناو. بەزرەک؛ گیاکەتان 🇮🇷 بَزرَک

**بەزەک / bezek/**: ناو. زەردوویی؛ نەخۆشی زەردوویی 🇮🇷 یَرقان

**بەزەو / bezew/**: سارستە. خۆزگە؛ خۆزگا؛ خۆزیا 🇮🇷 ای کاش

**بەزەوی / bezewî/**: ☜ بەزەیی

**بەزەی / bezey/**: ☜ بەزەیی

**بەزەین / bezeyn/**: ئاوەڵناو. بیرا؛ زۆر بە بیر و هۆش 🇮🇷 دارای حافظەی قوی

**بەزەیی / bezeyî/**: ناو. بەزە؛ بەزەوی؛ بزی؛ بەزەی؛ دڵنەرمی؛ دڵسۆزی ‹بۆ بێکەسی خۆم دەناڵم/ کافر بەزەیی دێ بە حاڵم «فولکلۆر»› 🇮🇷 رحم

▣ **بەزەیی پێدا هاتن/ هاتنەوە** زگ بۆ سووتان؛ دڵ بۆ سووتیانەوە ‹ئەو لە خوێن‌مژتنی تۆ تێر نابێ/ تۆ دەبێ بۆ بەزەییت پێدا بێ؟! «هێمن»› 🇮🇷 دل به حال کسی سوختن

**بەزی**[1] **/ bezî/**: ناو. جۆرێ سابوون 🇮🇷 نوعی صابون

**بەزی**[2]: ئاوەڵناو. زیدار؛ دڕکاوی 🇮🇷 خاردار

**بەزیاگ / bezyag/**: ☜ بەزیو

**بەزیان / bezyan/**: ☜ بەزین[1]ـ١

**بەزیپک / bezîpk/**: ئاوەڵناو. ژیر؛ عاقڵ ‹کە دۆستی خۆمە میری ئەو ولاتە/ ئەمیرێکی بەزیپک و دەسەلاتە «هێمن»› 🇮🇷 فهمیده

**بەزیپکوزاکوون / bezîpk û zakûn/**: ئاوەڵناو. تێگەیشتوو؛ ژیر ‹ڕێبوارێکم ئازا و بەزیپک‌وزاکوون/ دەبڕم چۆڵ‌وچیا و پێدەشت و بێروون «هێمن»› 🇮🇷 فهمیده؛ عاقل

**بەزیپکە / bezîpke/**: ئاوەڵناو. جۆشن؛ بەزیپکە؛ خاوەن جۆش 🇮🇷 دارای جوش

**بەزین**[1] **/ bezîn/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //بەزیت؛ دەبەزی؛ ببەزە// ١. بەزیان؛ شکست خواردن؛ لە بەر دژ دانەواندن ‹دێم و ناترسم لە پەرژینی بەزی/ هەر پەری سەرکەوت و دێوەزمە بەزی «هێمن»› ٢. غاردان ‹تۆ خۆش دەبەزی ئەسپی بەزینت پێیە/ من ناگەمە تۆ، ئەسپی بەزینم پێیە! «حاجی قادر»› ٣. باز هاویشتن و بە لەز چوون ‹زانی کو قەوی خەرابە ئەحوال/ ڕابوو ب لەز و بەزی و چوو ماڵ «خانی»› ٤. سوار بوون؛ پەڕین (وەک فەحل لە ماین) 🇮🇷 ١. شکست خوردن ٢. دویدن ٣. شتابان رفتن ۴. جفتگیری کردن (اسب و مادیان)

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: بەزیو/ چاوگی نەرێنی: نەبەزین

**بەزین**[2]: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی ئەسپی زین لە پشت 🇮🇷 زین شده

**بەزیو / bezîw/**: ئاوەڵناو. بەزیاگ؛ دانیاو ‹کەچی، وا کەوی و دەستەمۆی دەستەڵاتی ڕکەی دۆڵ و شیون/ لەبەر سامی ڕێ/ وا بەزیو و تەزیون! «سوارە»›.

بەرانبەر: **نەبەزیو** 🇮🇷 مغلوب

**بەزێن**[1] **/ bezên/**: ناو. گاڵتە و گەمەیەکی منداڵانە 🇮🇷 از بازی‌های کودکانە

ـ **بەزێن**[2]: پاشەوشە. ١. شکستدەر ‹هێزێک بێ دوژمن‌بەزێن بێ/ مستێک بێ گورچووتەزێن بێ «هێمن»› ٢. تێپەڕێن ‹سنووربەزێن› 🇮🇷 ١. ـ افکن ٢. ـگریز

**بەژ / bej/**: ناو. وشکانی؛ بەڕ ‹ڕۆشنکەرەوەی بەژ و کەژ و کۆ/ کاتێ کە وەسەرکەوت لە ئاسۆ «هەژار، مەم و زین»› 🇮🇷 خشکی

**بەژ ئاڤی / bej 'avî/**: ئاوەڵناو. وشکاوی؛ تایبەتمەندی زیندەوەرێ کە هەم لە وشکایی و هەم لە ئاودا دەژی 🇮🇷 دوزیست

**بەژاف / bejaf/**: ناو. دێمەکار؛ دێم 🇮🇷 زمین دیم

**بەژاڤیت / bejavît/**: ناو. بیانوو؛ بیانک 🇮🇷 بهانه

**بەژان / bejan/**: ئاوەڵناو. بەئازار؛ لە ژان؛ بە ئێش و دەرد 🇮🇷 دردناک

**بەژڤین / bej(i)vîn/**: چاوگ. جیق دەرهاتن؛ ورد بوون لە ژێر شتی قورسدا 🇮🇷 له شدن

**بەژک / bejik/**: ئاوەڵناو. بەژی؛ دێمەکار؛ چێندراو بە بێ ئاو 🇮🇷 دیمی

**بەژکی / bejkî/**: ناو. بەژگی؛ ناکۆکی؛ ناتەبایی 🇮🇷

ناسازگاری

**بەژگی / bejgî/**: ☜ **بەژکی**

**بەژمنێر / bejimnêr/**: ئاوەڵناو. خاوەنشکۆ ⚑ باشکوه

**بەژن / bej(i)n/**: ناو. بالا؛ قام؛ قەد؛ چڵ ‹بەژنەکەت سێدارەیە، کەزیەت تەنافە، زووبە دەی/ بیخە ئەستۆی من کە کوردم، کورد بەشی خنکاندنە «هێمن»› ⚑ قد و قواره

**بەژن / bejin/**: ئاوەڵناو. ژندار ⚑ متأهل (مرد)

**بەژنباریک / bej(i)nbarîk/**: ئاوەڵناو. ناوقەدباریک؛ بەژنزراڤ؛ بەژنزراو ⚑ کمرباریک

**بەژنبڵند / bej(i)nb(i)łind/**: ☜ **بالابەرز**

**بەژنبەرز / bej(i)nberz/**: ☜ **بالابەرز**

**بەژنڕێک / bej(i)nřêk/**: ئاوەڵناو. بالا جوان؛ خاوەن قەد و بالا ڕێک و لەبار ⚑ خوشاندام

**بەژنزراڤ / bej(i)nz(i)rav/**: ☜ **بەژنباریك**

**بەژنزراو / bej(i)nz(i)raw/**: ☜ **بەژنباریك**

**بەژنکورت / bej(i)nkurt/**: ئاوەڵناو. کورتەبالا؛ کورتەڵە ⚑ کوتاەقد

**بەژنوبالا / bej û bała/**: ناو. قەد و بالا؛ قەلافەت ‹بەژنوبالاکەت نموونەی هەیکەلی یۆنانییە/ لارولەنجەت مۆسیقایە، بەستەیە، گۆرانییە «هەردی»› ⚑ قد و بالا

**بەژنەدار / bejnedar/**: ناو. کۆتەدار ⚑ تنەی درخت

**بەژۆک / bejok/**: ئاوەڵناو. زۆربلێ ⚑ پُرچانه

**بەژی / bejî/**: ناو. دەغلی دێمی؛ داهاتی دێمەکار ⚑ محصول دیمی

**بەس[1] / bes/**: ناو. ١. بەست؛ جێگەی مانگرتن ٢. مان * هەروەها: **بەس گرتن** ⚑ ١. بست ٢. اعتصاب

**بەس[2]**: ئاوەڵناو. بەسندە ‹حەمدی خوا ئەکەم بەسە بۆ ئیفتیخاری من/ دیوانیان لە مەجلیس ئەکەن ئینتیزاری من «حەمدی»›. هەروەها: **بەس بوون؛ بەس کردن** ⚑ کافی

**بەس[3]**: ئاوەڵکار. ١. تەنیا؛ فەقەت ‹ئەم خەمە، خەمی شاخێکە/ بەیانییەک بە یەک چرکە/ یەک چرکە و بەس/ پۆلێ ئاسکی گوڵبژێری بکەوێتە بنپێی هەرەس «پەشێو»› ٢. کەم ‹بەس هەڵبخولێ بە دەوری پیس و پاکا/ تا کەنگێ بە شوێن هەموو خراپ و چاکا؟ «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ⚑ ١. فقط ٢. کم

• **بەس[4]**: پاشەوشە. بەست: ١. بەستراو ‹گرێبەس؛ داربەس› ٢. تەنراو ‹هەڵبەس› ⚑ ١. بند ٢. بافته

**بەسات[1] / besat/**: ناو. هۆی کردنی کارێک ⚑ انگیزه

**بەسات[2]**: ئاوەڵکار. بە وەخت و کات ⚑ به وقت

**بەساڵاچوو / besałaçû/**: ئاوەڵناو. پیر؛ زورهان ⚑ سالمند

**بەسام / besam/**: ئاوەڵناو. سامناک؛ سامدار؛ ساقدار؛ زەرندە؛ جێترس؛ بە هەیبەت ‹هەرچی کۆڵان و شەقامە/ دەڵێی کاولاشی بەسامە «هێمن»› ⚑ ترسناک

**بەست[1] / best/**: ناو. ١. بەس؛ جێگەی مانگرتن ‹هاتی وا سەیری نەهاتی کەن کە سەد تیپان سوار/ پاسەوانی بوون، لە ناو بەستا پیادێ کردی مات «مەحوی»› ٢. گرێ و لەمپەر و بەرگر ٣. قەراخ چەمی خیزەڵان ٤. کاریتەی دارەڕا ٥. چەمی نیوە وشک و کەمئاو ٦. بەند؛ لافاوگێڕەوە ٧. جێگای داخستنی درگا بە ئالقەڕێز و دوولایی ٨. دەشت؛ دەشتە؛ چۆڵ؛ لەیلان ⚑ ١. بست ٢. مانع ٣. کرانەی شنی رودخانە ۴. دیرک ۵. رودخانەی کمآب ۶. سیلبند ۷. جای قفل ۸. دشت

**بەست[2]**: پاشەوشە. ١. بەستراو ‹داربەست؛ بنبەست› ٢. پێوەدراو؛ داخراو ‹دەربەست› ٣. بێن؛ بەست ‹دەمبەست› ٤. ئازاد ‹سەربەست› ⚑ ١و٢. ـ بست ٣. ـ بند ۴. آزاد

**بەست[3]**: پێرۆ. ← **بەندوبەست**

**بەستران / best(i)ran/**: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //بەسترای؛ دەبەسترێی؛ ببەسترێ// بەسران؛

بەسیان: ١. گرێ خـواردن؛ گـرێ دران ٢. توانـا نەبوون لە کردنی کارێـک (تێبینی: ئـەم چاوگـە زۆرتر لەمەڕ زاواوە، کاتێ دەچێتە پەردەوە، دەگوترێ، کە گوایە بە نزا یان جادوو، بەری پـێ گـیراوە لەگـەڵ بووکدا جووت بێ) ٣. پێوەدران؛ داخران؛ تـەعتیل کران ☲ ١. گـره خـوردن ٢. بسته شـدن (دامـاد) ٣. چفت و بست شدن ۴. تعطیل شدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: بەسـتراو/ چـاوگی نـەرێنی: نەبەستران

**بەسترانەوە / best(i)ranewe**/: چـاوگ. تێنەپـەڕ. //بەسـترایەتەوە؛ دەبەسـترێیەوە؛ ببەسـترێوە// بـە شوێنێکەوە بەند بوون و هیچ لێ نەهاتن ☲ بسـته شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: بەستراوەوە/ چـاوگی نـەرێنی: نەبەسترانەوە

**بەستراو / bestiraw**/: ئاوەڵـناو. بەسـراو؛ بەسـیاگ: ١. بەنـدکراو؛ گرێـدراو ٢. تایبەتمەنـدی زاوای ناهومێد کە هیچی پێناکرێ ☲ ١. بسـته شـده ٢. بسته (داماد)

**بەسترپێر**[١] **/ bestirpêr**/: نـاو. بترپێـر؛ بـەترپیر؛ بەترپێرار؛ پەسرپێرەکە ‹بەسترپێر هەینی بوو، ئەوڕۆ چ ڕۆژێکە؟› ☲ پس‌پریروز

**بەسترپێر**[٢]: ئاوەڵـکار. بترپێـر؛ بـەترپیر؛ بـەترپێر؛ پەسرپێرەکە ‹بەسترپێر گەڕامەوە› ☲ پس‌پریروز

**بەسترپێرار**[١] **/ bestirpêrar**/: نـاو. سێ ساڵ پـێش؛ بەترپێرار؛ پەسرپێرارەکە ‹بەسترپێرار خۆشتر بـوو› ☲ پس‌پیرارسال

**بەسترپێرار**[٢]: ئاوەڵـکار. سێ ساڵ پێش؛ بـەترپێرار؛ پەسـرپێرارەکە ‹بەسـترپێرار شـووی کـرد› ☲ پس‌پیرارسال

**بەستن / bestin**/: چـاوگ. تێنەپـەڕ. //بەسـتت؛ دەبەستێ؛ ببەستە// بەسن: ١. گرێ دان؛ شەتەک دان؛ بەند کـردن ٢. ڕچـان؛ سـەهۆڵ کـردن ٣. مـەیین؛ گرسـان ٤. داخسـتن ٥. بیسـتن ٦. تەعتیل کـردن ☲ ١. بسـتن (چـیزی را) ٢. منجمـد شـدن ٣. منعقـد شـدن ۴. بسـتن (در) ۵. شـنیدن ۶ تعطیل کردن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: بەسـتوو/ چـاوگی نـەرێنی: نەبەستن

**بەستنەوە / best(i)newe**/: چاوگ. تێپەڕ. //بەسـتتەوە؛ دەبەستیەوە؛ ببەسـتەوە// وەبەسـتن؛ قـایم کـردنی شتێ بە شتێکەوە ☲ چیزی را به چیز دیگر بستن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەبەستنەوە

**بەستۆڕە / bestoře**/: نـاو. چۆمـێ کـە لـە هاوینـدا وشک دەکا ☲ رود فصلی

**بەستۆک / bestok**/: ئاوەڵـناو. بەستۆکە؛ داوێن‌تەڕی بە دەست هەرکەسەوە ☲ فاحشه

**بەستۆکە / bestoke**/: ☜ بەستۆک

**بەستو**[١] **/ bestû**/: ناو. کووپەڵە ☲ خُم کوچک

**بەستو**[٢]: ئاوەڵناو. ١. ڕچاو ٢. گرسـاو ☲ ١. منجمـد ٢. منعقدشده

**بەستورک / bestûrk**/: ناو. بەرستوورک؛ ملیـوان و یەخەی کراس ☲ یقەی پیراهن

**بەستە**[١] **/ beste**/: ناو. ١. بەهرە؛ فایدە ٢. دەسـک؛ چەپک؛ باقە؛ باغه ٣. سەربەند؛ گۆرانی سووکەڵـە و بن بزێوکە ‹ئامان لەرزانە، هارەی لەرزانە/ بەستەی هەڵـپەڕکێی بالابەرزانـە «گـۆران»› ٤. شـیعری ڕەسـەنی کـوردی ‹وەک مـانگی جێـژن لێیـان دەڕوانی/ پێیـان هەڵـدەگوت بەسـتە و گـۆرانی «هـێمن»› ٥. بەسە؛ چەند شتی پێکەوە بەسـتراو ٦. هێڵی نێوان دوو مـەزرا ☲ ١. فایـده ٢. بسـتەی گیاه ٣. آهنگ ضـربی؛ ترانـەی شـاد ۴. شـعر اصـیل کُردی ۵. بسته ۶ خط فاصل دو مزرعه

**بەستە**[٢]: ئاوەڵـناو. بەندیوار؛ بەستراو؛ بەسراو ‹حەڵقە ـحەڵقەی چ دەکەی داوی کەمەنـدی زولـفت؟/ بـۆ دڵی خەستە کە وا بەستەیی هەوداێکە؟! «نالی»› ☲

وابسته

• **بەستە**[٢]: پاشەوشە. ـ بەستراو؛ ـ بەسیا ‹لە حەق بێزار و دلبەستەی ڕیایی/ یەکەم تۆچێنی کێلگەی بێوەفایی «هەژار، *مەم و زین*»› ☰ ـ بسته

**بەستەبەندی** / bestebendî/: ناوەڵناو. بەسەبەندی؛ ڕەوتی دەستە کردن و پێچانەوە؛ بەستە ـ بەستە کردن ☰ بستەبندی

**بەستەزمان** / bestezman/: ناوەڵناو. بەسەزمان؛ بەسەزوان؛ بەسزوان؛ بەسزمان: ١. *[کینایە]* فەقیرۆکە؛ بێدەمووپل ‹منیش بەستەزمان و فەقیر/ دیسان لە تەپلە ئەکەم گیر «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ٢. دەمبەسراو؛ زاربەستە ‹هەلە پاڕانەوە ئەمڕۆ، زوبان و دڵ لە کارایە/ زوبان‌ئاوەر کە بەستەزمانە سبحەینێ، کە قووچا دەم «مەحوی»› ☰ ١. زبان‌بسته ٢. دهان‌بسته

**بەستەزمانۆکە** / bestez(i)manoke/: ناوەڵناو. شێتوکە؛ سادە و بێفێڵ و فەرەج ☰ خُل‌مزاج

**بەستەک** / bestek/: ناو. ١. دەستەنوێن ٢. بەستەی گۆرانی ☰ ١. رختخواب ٢. ترانه

**بەستەگی** / bestegî/: ناو. پەیوەند ☰ بستگی

**بەستەڵان** / besteɫan/: ☜ بەستەڵەك

**بەستەڵۆک** / besteɫok/: ☜ بەستەڵەك

**بەستەڵە** / besteɫe/: ☜ بەستەڵەك

**بەستەڵەک**[١] / besteɫek/: ناو. بەستەڵۆک؛ بەستەڵە؛ بەستەڵان؛ بەسلک؛ بەسلەک؛ بەسەڵەک ‹دێم بەرەو بەفر و چلوورە و بەستەڵەک/ دێم بەرەو شیخاڵ و ڕێچکە و ڕەشبەڵەک «هێمن»› ☰ یخبندان

**بەستەڵەک**[٢]: ناوەڵناو. بەستەڵۆک؛ بەستەڵە؛ بەستەڵان؛ بەسلک؛ بەسلەک؛ بەسلەکە؛ بەسەڵەک ‹لە ڕۆژی بەستەڵەکدا گەرمەک و ئاگردانتان نیم؟ «پەشێو»› ☰ یخبندان

**بەستەنی** / bestenî/: ناو. بەسەنی: ١. بەفرینە؛ دۆندرمە؛ دۆڵدرمە؛ چلوورە؛ بووزە؛ جۆرێک ساردەمەنی لە شیر و شەکری سۆڵبەستوو ٢. زەوینی بەستەڵەک ☰ ١. بستنی ٢. زمین یخ بسته

**بەستەوانی** / bestewanî/: ناو. دۆخی میز گیران ☰ حالت شاشبند

**بەستەی** / bestey/: چاوگ. بەستن ☰ بستن

**بەستی** / bestî/: ناو. ١. سەهۆڵ؛ سۆڵ؛ یەخ ٢. تەختایی بن ئاو ٣. کوولەکە ٤. تەرم ☰ ١. یخ ٢. بستر؛ کف (رودخانه) ٣. کدو ٤. جنازه

**بەستیار** / bestyar/: ☜ بیستیار

**بەستیر** / bestîr/: ناو. جۆرێ مافوور و قاڵی ☰ نوعی فرش

**بەستێن** / bestên/: ناو. ١. ڕەخی ڕووبار؛ دەمچەم؛ گوێچەم؛ زیخەڵانی دەم ڕۆخانە ‹دێم بەرەو لێڕ و چڕ و بەستێن و چۆم/ دێم بەرەو هەڵدێر و گێژ و بەند و گۆم «هێمن»› ٢. سنوور؛ کەوشەن؛ مەرز ‹لێرەش لە نێو دەریای ڕقی بێ بەستێن/ لێرەش لە نێو کوڕانی تۆڵەئەستێن «هێمن»› ٣. *[مەجاز]* بارودۆخی پێویست بۆ بەدیهاتنی شتێک ‹خۆش کردنی بەستێن بۆ هاتنی گەشتیاران› ☰ ١. کنارەی رود ٢. مرز ٣. بستر؛ زمینه

**بەسران** / besran/: ☜ بەستران

**بەسراو** / besraw/: ☜ بەستراو

ـ **بەسراوی** / besrawî-/: پاشەوشە. ـ بەسیاگی؛ بەسراو بوون ‹لە بازاڕی دڵا سووتا هەموو سەرمایەیی خۆشیم/ لە یانەی دەستوپێبەسراوییا بێسوود و سەودا خۆم «بێخود»› ☰ ـ بستگی؛ حالت بسته بودن

**بەسرپێر**[١] / besirpêr/: ناو. پەسرپێرەکە؛ بەترپێری؛ پەراوەرێ؛ پەراوەرێکە؛ پەراپەسەرێ؛ سێ‌ڕۆژ لەمەوبەر ‹بەسرپێر ڕۆژێکی سارد بوو› ☰ پس‌پریروز؛ سه روز پیش

**بەسرپێر**[٢]: ناوەڵکار. پەسرپێرەکە؛ لە پەسەپێرەکەدا؛ بەترپێری؛ پەراپەسەرێ؛ لە

پترپێریدا؛ لە پەسرپێرەکەدا ‹بەستربێر گەڕامەوە›
🇸🇦 پس‌پریروز؛ سە روز پیش

**بەسرپێرار**[1] / besirpêrar/: ناو. پەسەپێرار؛ پەسەپێرارەکە؛ پەسرپێرارەکە؛ پەرەوێرار؛ بەترپێرار؛ سێ ساڵ لەمەوبەر ‹بەسرپێرار زستانەکەی سارد بوو› 🇸🇦 پس‌پیرارسال؛ سە سال پیش

**بەسرپێرار**[2]: ئاوەڵکار. پەسرپێرارەکە؛ لە پەسەپێرارەکەدا؛ لە پەسەپێرارا؛ بەترپێرار؛ پەرەوێرارەنە؛ پەرەوێرارەوە؛ لە سێ‌ساڵ لەمەوبەردا ‹ئەو ماڵەم بەسرپێرار کردەوە› 🇸🇦 پس‌پیرارسال؛ سە سال پیش

**بەسزمان** / besiz(i)man/: ☜ **بەستەزمان**

**بەسزوان** / besiz(i)wan/: ☜ **بەستەزمان**

**بەسعود** / bes'ûd/: ئاوەڵناو. خواپێداو؛ خواپێداگ؛ بەختەوەر 🇸🇦 خُداداده

**بەسکیتباڵ** / beskîtbał/: ناو. یاری دوو دەستەی پێنج کەسی لە زەوی تایبەتدا، هەر دەستە هەوڵ دەدا تۆپ لە سەلەی ئەوی تر بخا 🇸🇦 بسکتبال

**بەسلەمە** / besleme/: ئاوەڵناو. دابەستە؛ پەرواری 🇸🇦 پرواری

**بەسڵک** / besiłk/: ناو. ١. سەهۆڵ ٢. بەستەنی ٣. سەهۆڵبەندان 🇸🇦 ١. یخ ٢. بستنی ٣. یخبندان

**بەسڵەک** / besiłek/: ☜ **بەستەڵەك**

**بەسڵەکە** / besiłeke/: ☜ **بەستەڵەك**

**بەسن** / besin/: ☜ **بەستن**

**بەسندە** / besinde/: ئاوەڵناو. بەسنە؛ بەس؛ وەس 🇸🇦 بس

**بەسنە** / bes(i)ne/: ☜ **بەسندە**

**بەسۆ** / beso/: ئاوەڵناو. بەداخ؛ تێکەڵ بە خەم ‹بوتی ساحەبدلانی دل بەسۆیە/ کە ئەورۆ پێی دەنازێ شاری کۆیە «هێمن»› 🇸🇦 سوزناک

**بەسۆز** / besoz/: ئاوەڵناو. سۆزاوی؛ خەماوی یان خەم‌هێنەر ‹ئەی هاودەم و ڕاز و هاونشینم!/ من تۆش وەکوو خۆم بەسۆز دەبینم «هەژار، *مەم و زین*»› 🇸🇦 سوزناک

**بەسە** / bese/: ☜ **بەستە**[1]_٥

**بەسەبەندی** / besebendî/: ☜ **بەستەبەندی**

**بەسەروبەر** / beser û ber/: ئاوەڵناو. ڕێک‌وپێک ‹ماڵی بەسەروبەر› 🇸🇦 مُنظّم

**بەسەروبەرەوە** / beser û berewe/: ئاوەڵکار. بە یەکجاری 🇸🇦 یکجا

**بەسەروزمان** / beser û z(i)man/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* زیرەک و وریا و قسەزان 🇸🇦 زیرک و زبان‌آور

**بەسەرهات** / beserhat/: ناو. سەرگوروشتە؛ سەربهورد 🇸🇦 سرگذشت

**بەسەرهەڤ**[1] / beserhev/: ناو. سەلەم 🇸🇦 پیش‌خرید

**بەسەرهەڤ**[2]: ئاوەڵکار. سەرجەم 🇸🇦 جمعاً؛ سرجمع

**بەسەزمان** / besez(i)man/: ☜ **بەستەزمان**

**بەسەزوان** / besez(i)wan/: ☜ **بەستەزمان**

**بەسەڵەک** / besełek/: ☜ **بەستەڵەك**

**بەسەنی** / besenî/: ☜ **بەستەنی**

**بەسی** / besî/: ناو. مانگر 🇸🇦 بستی

**بەسیاگ** / besyag/: ئاوەڵناو. بەستراو 🇸🇦 بسته

**بەسیان** / besyan/: چاوگ. بەستران 🇸🇦 بستن؛ بسته شدن

**بەسیلە** / besîle/: ☜ **بەرسیلە**

**بەش**[1] / beş/: ناو. ١. بەشە؛ واش؛ بەری؛ وەش؛ بیەش؛ بێش؛ پش؛ پشک؛ بەربەش؛ هەر یەکە لە پاژەگەلی پووڵ یان سەرمایەیێ ٢. ماف؛ بەشە؛ واش؛ بەری؛ بێش؛ وەش؛ بیەش؛ پش؛ پشک؛ حەق؛ پاژێ لە شتێک کە هی کەسێکە ‹برا تۆ لەو هەموو بیدمشکە دەیخۆی/ وەکوو مەنگوڕ دەڵێ، کوانێ بەشێ من؟! «حەقیقی»› ٣. دابەش ‹گۆشتەکە بەش کە!› ٤. پاژ؛ پارچە ‹دنیا لە پێنج بەش، چوار بەشی ئاوە› ٥. بێز؛ ڕەنگ ٦. بوار و

گـرۆی خوێنـدنی بـالا ☰ ١و٢. سـهم ٣. تقسـیم؛ قسمت ۴. بخش؛ جزء ۵. واش؛ فام ۶. گروه تحصیلی دانشگاهی

⊡ **بەش بە حاڵی خۆ:** لە بـیر و ڕا و حاڵـی بـوونی خۆ ‹بەش بـە حاڵـی خـۆم لـەو بڕوایـەدام ئەگـەر دەسـتەوەکەری کرابـا و ئێمـە ئـەزموونی شۆڕشگێڕیمان هەبا، مێژووی کۆماری مەهاباد بـەو جۆرە دوایی نەدەهات کـە هـات «هـێمن»› ☰ در بارەی خود؛ نسبت به خود

⊡ **بەش بڕان:** بێ‌بـەش بـوون؛ بێـوەری بـوون ☰ محروم شدن

**بـەش بـڕین:** ١. بـێ‌بـەش کـردن ٢. *[نـزا]* دەستەواژەی ناڕەزایی نواندن ‹ئەی بەشت ببڕم، ئەوە بۆ وات کرد؟› ☰ ١. بی‌نصیب کردن ٢. نوعی عبارت اعتراضی

**بـەش بـوون:** ١. پـاژ بـوون ٢. دەم کردنـەوەی برین؛ ئاوڵە بوونی زام ☰ ١. مجزا شدن ٢. دهـن باز کردن زخم

**بەش خواردن:** ماڵ‌خواردن؛ تەپ دانە سەر بەشی دیتران ☰ ماڵ‌خوردن

**بەش کردن:** ١. بەخشینەوە ‹هەرچیکی هەبوو بـە خزمانیدا بەشی کردەوە› ٢. لەت‌وکـوت کـردن؛ جیا‌ـ‌جیا کردنەوە؛ ‹دا ئەو گۆشتە بەش کە!› ٣. تێر کردن ‹ئەو تۆزە بەشم ناکـا› ☰ ١. بخشـیدن ٢. تقسیم کردن ٣. کفایت کردن؛ بس بودن

**بـەش**[2]: ئاوەڵناو. ١. ئاواڵە؛ والا ٢. شووم و بێ‌فەڕ ٣. نێوچاوان سپی (بۆ ئاژەڵ) ☰ ١. باز؛ گشاده ٢. شـوم ٣. پیشانی سفید

⊡ **بـەش کردنـەوە:** ١. دابـەش کـردن ٢. لێـک کرانەوە ‹برینەکەی دەمی بەش کردۆتەوە› ☰ ١. تقسیم کردن ٢. از هم گشودن

**بەش**[3]: دەنگ. خودا بکا؛ قسمەت وا بـێ؛ بەشـکوو ‹بەش بەی پیەنە!› ☰ کاش

• **بەش**[4]: پاشوشە. بەشدار ‹برابەش› ☰ سهیم

**بەشـارکانێ / beşarkanê/:** نـاو. چاوشـارەکێ؛ قەرا‌ـ قەرا؛ قەرە‌ـ قەرە ☰ قایم‌موشک

**بەشارەت / beşaret/:** ناو. هۆش و گۆش ☰ هوش

⊡ **بەشارەت بەسیان:** دەسەپاچە بـوون؛ واق‌وڕمـان ☰ دستپاچه شدن

**بەشاڤەند / beşavend/:** ☜ بەشاوەند

**بەشاکەر / beşaker/:** ☜ بەشکەر

**بەشـانەکەر / beşaneker/:** نـاو. شـەکەر؛ مـوو لەشانەدەر ☰ شانەزن

**بەشانەوە / beşanewe/:** ☜ بەشینەوە

**بەشـاوەند / beşawend/:** نـاو. سـەروا؛ قافیـە؛ بەشاڤەند؛ پاشڵ بۆ شیعر ☰ قافیه

**بەشبڕاو / beşb(i)řaw/:** ئاوەڵناو. بێ‌بەش؛ بێـوەری ☰ بی‌بهره؛ عاق

**بەشـبەر / beşber/:** نـاو. میراتگـر؛ کەلـەپوورگر. هەروەها: **بەشبەری** ☰ وارث

**بـەش‌ـ‌بـەش**[1] / beş beş/: نـاو. بـەش؛ دابـەش ☰ تقسیم

⊡ **بەش‌ـ‌بەش کردن:** دابەش کردنـەوە ‹بـە میـزانی عەدالەت بەش ـ بەشی کـەن/ چ فـەرقێکی نـەبێ سالار و گاوان «قـانع»› ☰ تقسیم کـردن؛ قسـمت کردن

**بەش‌ـ‌بەش**[2]: ئاوەڵناو. لەت ـ لـەت؛ کـوت ـ کـوت ‹ماڵی بەش ـ بەش› ☰ مجزا؛ قسمت ـ قسمت

**بەش ـ بەش**[3]: ئاوەڵکار. لەت ـ لەت؛ کوت ـ کـوت ‹قەرزەکەی بەش ـ بەش داوە› ☰ جزء ـ جزء

**بەش‌بەشـی / beşbeşî/:** ئاوەڵکار. پچڕـ‌ـ پچـڕ؛ کەم‌ـ‌کەم ☰ پارە ـ پارە

**بەشت / beş(i)t/:** ناو. کاریتەی خانوو ☰ بالار

**بەش‌خوراو / beşxuraw/:** ئاوەڵناو. بـەش‌خوریـاگ؛ ماڵ‌خوراو ‹کوردی بەش‌خوراو› ☰ ماڵ‌باخته

**بەش‌خوریاگ / beşxuryag/:** ☜ بەش‌خوراو

**بەشدار**[1] / beşdar/: ناو. *[مەجاز]* سەگی پاس سگ پاس

**بەشدار**[2]: ئاوەڵناو. ١. خاوەن بەش ‹کوڕ و کچ هەردوو بەشداری ژینن/ هەردوو نەمامی سەر ڕووی زەمینن «موفتی پێنجوێنی»› ٢. هاوبەش؛ هامبەش؛ شەریک ١. سهامدار ٢. سهیم

⊡ **بەشدار بون**: هاوبەش بوون؛ بەش تێدا هەبوون ‹منیش، بەپێی توانای خۆم لەو خەباتەدا بەشدار بووم «هێمن»› سهم داشتن

**بەشدارگە** / beşdarge/: ناو. بەشگە؛ هاوبەشگە؛ کۆبەش؛ شیرکەت؛ شەریکە؛ دامەزراوەیەکی مافی کە بە هاوقۆڵی چەند کەس بۆ چالاکییەکی بازرگانی پێکهاتووە ‹بەشدارگەی پیشەیی› شرکت

**بەشدارەکی** / beşdarekî/: ناو. ئەندامەتی عضویت

**بەشداری**[1] / beşdarî/: ناو. ١. هاوکاری؛ هاریکاری ٢. ئەندامەتی ٣. دۆخی خاوەن بەش بوون ١. همکاری ٢. عضویت ٣. حالت سهم داشتن

⊡ **بەشداری کردن**: ١. هاوڕێیی کردن؛ هاوکاری کردن ‹تاهیر دڵی تاریکە لە زوڵماتی حەوادیس/ بەشداری لە شوعلەی گەشی ئەنواری قیدەم کە! «سەید تاهیر هاشمی»› ٢. هاوبەشی کردن؛ دەست تێدا بردن ١. همراهی کردن ٢. شرکت کردن

**بەشداری**[2]: ئاوەڵناو. باگوڕ؛ ئابوونە؛ ئەندامییەتی آبونه

**بەششاندن** / beşşandin/: چاوگ. قایل کردن رازی کردن

**بەشق** / beşq/: ئامراز. *[سوورکەڵە]* بە عیشق؛ بە خۆشەویستی؛ لەبەر؛ بۆ سوێندان و تکا دەیڵێن ‹دەمکوژێ، حوکمە دەزانم بەخودا، دەردی حەبیب/ وەرە سا بەشقی خودا دەس لە یەخەم بەردە تەبیب! «شێخ ڕەزا»› به عشق؛ به خاطر

**بەشقا** / beşqa/: ئاوەڵکار. ١. بەڵکە ٢. ڕەنگە؛ شایەتا ١. بلکه ٢. شاید

**بەشقەم** / beşqem/: ☜ **بەشکو**

**بەشک** / beşik/: ئاوەڵناو. بەگومان. هەروەها: **بەشک بوون** شک‌دار

**بەشکا** / beşka/: ئاوەڵکار. بەشکایە: ١. بەڵکەم ٢. وێدەچێ؛ شایەتا؛ دوور نییە ٣. *[سەرزارەکی]* گریمان؛ تەقا؛ تەقوو؛ جا ئەوە هاتوو ١. بلکه ٢. شاید ٣. فرضاً

**بەشکانە** / beşkane/: ناو. مزگێنی بەرخی تازەزاو کە شوان لە دەشت ئەیهێنێتەوە مژدەی نوزاد گوسفند که چوپان آورد

**بەشکایە** / beşkaye/: ☜ **بەشکا**

**بەشکایەک** / beşkayek/: ئاوەڵکار. بەشکایەکوو: ١. ئەگەرکوو؛ دنیابوو ٢. بەشکوو ١. احیاناً ٢. بلکه

**بەشکایەکو** / beşkayakû/: ☜ **بەشکایەك**

**بەشکراو** / beşk(i)raw/: ئاوەڵناو. بەشکریاگ؛ جیا-جیا بوو تقسیم‌شده

**بەشکریاگ** / beşkiryag/: ☜ **بەشکراو**

**بەشکم** / beşkim/: ئاوەڵکار. ١. بەشکا؛ گریمان؛ وامان دانا ٢. بەشکوو ١. گیرم ٢. بلکه

**بەشکۆ**[1] / beş(i)ko/: ناو. بازرگانی هاوبەشیی شرکت سهامی

**بەشکۆ**[2]: ئاوەڵناو. خاوەن شکۆ باشکوه

**بەشکۆیی** / beş(i)koyî/: ناو. عەزەمەت؛ گەورەیی عظمت

**بەشکو** / beşkû/: ئاوەڵکار. بەشکێکوو؛ بەشقەم: ١. شایەتا؛ بەشکا ‹نابمە میوانی کەلی هات و نەهات/ چارە کەم، بەشکوو ئەوا هات و نەهات «سوارە»› ٢. بەشکەم ‹لەم چەپگەڕییەت ببە پەشیمان/ بەشکوو بڕەوێ بەخت ڕەشیمان «هەژار، *مەم و زین*»› ١. شاید ٢. بلکه

**بەشکە** / beşke/: ئاوەلکار. شایەتا؛ بەشکا ☰ بلکە
**بەشکەر** / beşker/: ئاوەلناو. دابەشکەر؛ بەشاکەر؛ بەشکەرەوە ☰ مقسم
**بەشکەرەوە** / beşkerewe/: ☜ بەشکەر
**بەشکەم** / beşkem/: ئاوەلکار. بەشکا ☰ بلکە
**بەشکی** / beşkî/: ئاوەلکار. بەشکا ☰ بلکە
**بەشکێکم** / beşkêkim/: ئاوەلکار. بەشکا ☰ بلکە
**بەشکێکۆ** / beşkêko/: ☜ بەشکو
**بەشکێکو** / beşkêkû/: ئاوەلکار. بەشکا ☰ بلکە
**بەشگ** / beşg/: ناو. شەونم؛ خناو ☰ شبنم
**بەشگا** / beşga/: ناو. جێگەی دابەش کردنی ئاو؛ بناوانی ئاو ☰ محل تقسیم آب
**بەشگە** / beşge/: ناو. ١. جێ بەش کردن ٢. بەشدارگە؛ شەریکە ☰ ١. جای تقسیم ٢. شرکت
**بەشوار** / beş(i)war/: ئاوەلناو. زۆر بە کەف ☰ پُرکف
**بەشۆ** / beşo/: ئاوەلناو. ١. دەقدار؛ کەتیرە لێدراو ٢. شێدار ☰ ١. آهارزده ٢. نمدار
**بەشو** / beşû/: ئاوەلناو. شوودار؛ شووداره؛ مێرددار؛ بە مێر؛ خاوەن شوو ☰ شوهردار
**بەشە** / beşe/: ناو. ١. بەش؛ پاژ؛ پشک ٢. واش؛ ئامال؛ یەک لە سێ هێمانی پێکهێنەری ڕەنگ ☰ ١. سهم ٢. فام
**بەشەر** / beşer/: ناو. مرۆڤ؛ بنیادەم؛ مرۆ ☰ بشر
**بە شەرت**[1] / beşert/: ئاوەلناو. مەرجی؛ شەرت دار ‹شووتی بە شەرت› ☰ شرطی
**بە شەرت**[2]: ئاوەلکار. لە سەر گرێو؛ بە مەرج ‹بە شەرت دەیفرۆشم› ☰ به شرط
▣ **بە شەرتی جاران**: وەکوو جاران ‹بلێ پێم گولی بەهاری! لە تۆ تا بە کەی جودا بم؟/ وەرەوە، بە شەرتی جاران، رۆژی سەد جارت فیدا بم «وەفایی»› ☰ چون گذشته
**بە شەرتی چەقۆ**: ببینە! باش بوو ببیە ☰ بە شرط چاقو
**بە شەرتی شیرینی**: بیخۆ! شیرین بوو ئەوکات ببیە ☰ به شرط شیرینی
**بەشەرم** / beşerm/: ئاوەلناو. شەرمین؛ شەرمن؛ شەرمێون؛ فەدیکار ☰ محجوب
**بەشەروەکری** / beşerwek(i)rî/: ئاوەلناو. ڕووخۆش ☰ خوشرو
**بەشەرەف** / beşeref/: ئاوەلناو. ئابڕوودار؛ شەریف؛ خاوەنئابڕوو ☰ شریف
**بەشەن** / beşen/: ناو. قەلافەت؛ هەیکەل ☰ اندام
**بەشیر** / beşîr/: ئاوەلناو. تایبەتمەندی مێوینەی شیردار ☰ شیرده
**بەشینەوە** / beşînewe/: چاوگ. تێپەڕ. //بەشیتەوە؛ دەبەشیەوە؛ ببەشەوە// بەشانەوە: ١. دابەش کردن ٢. بەخشینەوە ☰ ١. تقسیم کردن ٢. توزیع کردن
■ ئاوەلناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەبەشینەوە
**بەشێ** / beşê/: ئاوەلکار. هنەک؛ هەند؛ بازێک؛ برێ ☰ بعضی
**بەشێنەیی** / beşêneyî/: ئاوەلکار. بەکاوەخۆ؛ لەسەرخۆ ☰ به آرامی
**بەع**[1] / be'/: ناو. *[منداڵانە]* بەعا؛ بەعەکە؛ مەڕ و بزن ☰ بُز و گوسفند
**بەع**[2]: دەنگ. باو؛ وشەیەکە بۆ گاڵتە دەگەڵ منال کردن ☰ کلمەای برای شوخی با کودک
**بەعا** / be'a/: ☜ بەع[1]
**بەعاستەم** / be'astem/: ئاوەلکار. بە ئاستەم؛ بەدەگمەن؛ زۆر کەم ‹بەعاستەم چاوم پێ بکەوێ› ☰ به نُدرت
**بەعجان** / be'can/: چاوگ. بەعجین؛ وەڕەز بوون؛ جاڕز بوون ☰ بیزار شدن
**بەعجاندن** / be'candin/: چاوگ. بەعەجاندن؛ بەهەجاندن؛ وەڕەز کردن؛ عاجز کردن؛ جاڕز کردن ☰ بیزار کردن

**بەعجین / be'cîn/:** ☜ **بەعجان**

**بەعزی / be'zî/:** جێناو. بەعزێ؛ بڕێ؛ بڕێک؛ هێندێ؛ هێندێک ‹نیمی لە مللەت کرانشینە/ بەس ک کرا داس، بیچارە بینە/ بەعزی دە پلاک کرایە سینی! «شامی»› ☰ بعضی

**بەعزێ[١] / be'zê/:** ئاوەڵناو. هێندێ؛ بڕێ ‹بەلام چیبکەین لە ناو چاوی ڕەشی بەعزێ زەکای گەورە/ وەکوو تۆوی گوڵی دەم با، لە سەر بەردێکی ڕەق ئەڕوێن «گۆران»› ☰ بعضی

**بەعزێ[٢]:** ئاوەڵکار. بڕێ؛ بڕێک ‹بەعزێ گەنج و ماڵ بەخشا وە ئەرژەنگ/ کەرد وە پاسەوان سپای خاترتەنگ «شانامە»› ☰ بعضی

**بەعزێ[٣]:** جێناو. بڕێ؛ هەندێکی ئەژمار نەکراو و دیار نەکری ‹ئەی وەتەن! بەعزێ بە ناوی تۆیەوە جاسووسی تام/ ئەی وەتەن! بەعزێ لە داخی تۆیە بوو بە پەندی عام «قانع»› ☰ بعضی

**بەعومر[١] / be'umr/:** ئاوەڵناو. بەعەمر؛ بەساڵاچوو؛ پیر ‹هەورازی کوور/ پشتی شاخێکی بەعومرە/ بۆ پێشمەرگە دانەویوە «شێرکۆ»› ☰ پیر

**بەعومر[٢]:** ئاوەڵکار. بەعەمر؛ هیچ کات؛ هەرگیز ‹بەعومرم شتی وام نەدیوە› ☰ هرگز

**بەعەج / be'ec/:** ناو. ترس ☰ ترس و بیم

**بەعەجاندن / be'ecandin/:** ☜ **بەعجاندن**

**بەعەزرەت / be'ezret/:** ئاوەڵناو. تاسەبار؛ تاسەدار ☰ آرزومند؛ مُشتاق

**بەعەکە / be'eke/:** ☜ بەع[١]

**بەعەمر / be'emr/:** ☜ **بەعومر**

**بەعی / be'î/:** ناو. پێشەکی سەودا ☰ بیع در معامله

**بەعیڤ / be'îv/:** ☜ **بادام**

**بەعینوان / be'înwan/:** ئاوەڵناو. نازفرۆش ☰ عشوەگر

**بەغمە / beğme/:** ناو. پێران؛ بوغمە؛ ملەخڕە؛ نەخۆشی دووشاخە ☰ خُناق

**بەغیرەت / beğîret/:** ئاوەڵناو. ١. بوێر؛ ئازا؛ نەترس ٢. جوامێر و بەناموس؛ خاوەن غیرەت ☰ ١. شجاع ٢. غیرتمند

**بەغیل / beğîl/:** ☜ **بەخیل**

**بەغێل / beğêł/:** ☜ **بەخیل**

**بەغێلی / beğêłî/:** ☜ **بەخیلی**

**بەفاڵ / befał/:** ئاوەڵناو. وەفاڵ؛ تایبەتمەندی ماکەر و ماینی نێرخواز و تامەزرۆی جووت بوون. هەروەها: **بەفاڵ بوون** ☰ نَرخواه (برای ستور ماده)

**بەفایدە / befayde/:** ئاوەڵناو. بەهرەدار؛ بەکەڵک ☰ فایدەدار

**بەفر / bef(i)r/:** ناو. بەرف؛ وەفر؛ وەور؛ ڤەور؛ وەرب؛ بەور؛ وەروە؛ ڤەر؛ ڤەرڤە؛ ویەر؛ دەنکی سپیلانەی ڕسکاو لە بۆقی ڕچاو، کە لە هەوای ساردا لە ئاسمانەوە دادەبارێ ☰ برف

▣ **بەفری یەک شەوە** *[کنایە]* تەواو سپی ☰ سفید یکدست

▣ **بەفر داکردن/ دادان** بەفر بارین ☰ برف باریدن

**بەفر ماڵین** پاک کردنەوە یان لادانی بەفر ☰ روبیدن برف

**بەفرئاسا / befr'asa/:** ☜ **بەفرین ـ١**

**بەفرانبار / befranbar/:** ناو. بەفرەمبار؛ بەفرەنبار؛ مانگی دەیەمی ساڵی هەتاوی کوردی کە سی ڕۆژە ‹دیسان بەفرانبار دایدا کرێوە/ دیسان ڕێبەندان سوپای بەڕێوە «حەقیقی»› ☰ دی؛ دیماه

**بەفراو / befraw/:** ناو. ئاوی بەفر ‹سەیری لوبنان و گەڕانی چین و ماچین بۆ بکەم/ تا ببن بەفراو و مێرگ و چیمەن و کوێستانی کورد «قانع»› ☰ برفاب

**بەفراوی / befrawî/:** ئاوەڵناو. ١. تێکەڵ بە بەفر؛ بە بەفرەوە تلاو ٢. سپی وەک بەفر ‹سەرت سپی و بەفراوییە/ دەروونت: کڵی ئاگری «هێمن»› ☰ ١و٢. برفی

**بەفربەسەر** / bef(i)rbeser/: ناو. بەفرەسەر؛ بەفری سەهۆڵبەستووی پەستواو کە بە سەریدا دەڕۆن و ناتەپێ ☰ برف متراکم و منجمد که بر آن روند

**بەفرخۆرکە** / bef(i)rxorke/: ناو. ١. تـەرزەی ورد ٢. مەلێکی بچووکە ☰ ١. تگرگ ریز ٢. پرندەایست

**بەفرکوش** / bef(i)rkuş/: ناو. شوێنی سەخڵەت لە کوێستان کە بەفرەکەی دێر دەتوێتەوە و عەرزەکەی ڕەق دەبێ ☰ نقاطی از کوهستان که برفش دیر آب می‌شود

**بەفرلادەر** / bef(i)rlader/: ناو. کەرستەیەک لە سەر جامی بەر و دوای ماشێن بۆ بەفر لادان ☰ برف‌پاک‌کُن

**بەفرماڵ** / bef(i)rmał/: نـاو. ١. بەفرماڵـک؛ بەفرەلۆ؛ بەفرەلوو؛ بەورەڵوو؛ وەروەرە؛ پاڕووی بەفر ماڵین ٢. کەرستە یان ماشینی تایبەتی بەفر ماڵین لە سەر شەقام و جادە ٣. ئەو کرێکارە بەفر دەماڵێ ☰ ١. پاروی ویژەی برفروبی ٢. ماشین برف‌روب ٣. کارگر برف‌روب

**بەفرماڵک** / bef(i)rmałik/: ☜ بەفرماڵ ـ١

**بەفرەچاڵ** / befreçał/: ناو. چاڵەبەفر: ١. نواڵەی نزار کە بەفری تا ماوەیەکی زۆر لێ‌ناتوێتەوە ٢. ئەو قووڵکەی لە چیا بەفری تێ دەکەن و دایدەپۆشن ☰ ١و٢. برفچال

**بەفرەخۆرە** / befrexore/: ناو. بەفری بلۆکە و کەم کە بە سەر بەفری دیدا دەباری و زووتر دەیتوێنێتەوە ☰ برف‌خورک

**بەفرەژیلکە** / befrejîlke/: نـاو. بەفرەلۆکـە؛ بەفرەلووکە؛ بەفری زۆر دەنک‌ورد ☰ برف دانه ریز

**بەفرەسەر** / befreser/: ناو. ١. ☜ بەفربەسەر ٢. خلیسکێن بە سەر بەفردا ☰ ١. ☜ بەفربەسەر ٢. اسکی

**بەفرەشینە** / befreşîne/: ناو. کاسەلکەشینە ☰ مرغ زنبورخوار

**بەفرەک** / befrek/: ناو. ١. هەڵمی ڕچاو وەک دەنکە بەفر لە سەر جام و ... ٢. خاڵ ـ خاڵی سپی لە سەر شاشەی تەلەڤیزیون و ڕادار ٣. زوقمی نێو یەخچاڵ و ساردینگ ☰ ١. برفک ٢. برفک تصویر ٣. برفک یخچال

**بەفرەلۆ** / befrelo/: ☜ بەفرماڵ ـ١

**بەفرەلۆکە** / befreloke/: ☜ بەفرەژیلکە

**بەفرەلوو** / befrelû/: ☜ بەفرماڵ ـ١

**بەفرەڵوکە** / befrełûke/: ☜ بەفرەژیلکە

**بەفرەمبار** / befrembar/: ☜ بەفرانبار

**بەفرەنبار** / befrenbar/: ☜ بەفرانبار

**بەفریک** / befrîk/: ناو. ١. سەهۆڵدان؛ جێگای بەفر و سەهۆڵ ٢. بەفرەلۆ ☰ ١. یخدان ٢. پاروی برف‌روبی

**بەفرین** / befrîn/: ناوەڵناو. ١. بەفرئاسا؛ وەک بەفر ‹لە ژێر ئاسمانی شینا/ لە پاڵ لووتکەی بەفرینا «گۆران»› ٢. لە جنسی بەفر ☰ ١. برف‌سان ٢. برفی

**بەفرینگ** / befrîng/: ناو. فریزێر؛ قەرسینک ☰ فریزر

**بەفرینە** / befrîne/: ناو. دۆندرمە؛ چلوورە؛ بەستەنی ☰ بستنی

**بەفریو** / bef(i)rîw/: ناوەڵناو. خاپینۆک؛ دەسبڕ؛ فێڵباز ☰ فریبکار

**بەفش** / befş/: ناو. ١. فرچەی مافوور ماڵین ٢. شەی جۆلایی ☰ ١. فرچەی فرش ٢. شانەی جولایی

**بەفشک** / befşik/: ناو. ١. فرچەی بچووک ٢. لۆلاقی دەست و پێ ☰ ١. فرچەی کوچک فرش ٢. مچ دست و پا

**بەفەڕ** / befeř/: ناوەڵناو. ١. ممبارەک؛ پیرۆز ٢. بەبەهرە ☰ ١. فرخُنده ٢. سودمند

**بەفیرۆچوو** / befîřoçû/: ناوەڵناو. ئاوبردوو ☰

بربادرفته

**بەفیز** / befîz/: ئاوەڵناو. بەدەعیە؛ بادیهەوا؛ لووتبەرز؛ دەمارزل 🇮🇷 مُتکبر

**بەفێرۆ** / befêřo/: ئاوەڵناو. بەترەف؛ لە دەست چوو 🇮🇷 تباه؛ هدرشده

**بەڤر** / bevir/: ناو. ١. تەور ٢. بەور؛ بەبر 🇮🇷 ١. تَبَر ٢. بَبر

**بەڤڕ** / beviř/: ئاوەڵناو. درۆزن 🇮🇷 دروغگو

**بەڤڕا** / beviřa/: ئاوەڵکار. پێکەوە؛ لەگەڵ یەکا؛ بهەڤڕا؛ وێڕا 🇮🇷 باهم

**بەڤز** / bevz/: ☜ بەوز[1]-٢

**بەڤل**[1] / bevil/: ناو. ١. بێڤل؛ لووت؛ کەپۆ ٢. کێوییەکی دڕندەیە لە تیرەی پشیلەکێوی ٣. دوژمنیی زۆر سەخت 🇮🇷 ١. بینی ٢. نوعی گربەی وحشی ٣. عناد

**بەڤل**[2]: ئاوەڵناو. هاوپایە 🇮🇷 همشأن

**بەق**[1] / beq/: ناو. ١. قرپۆک؛ بۆق؛ قورواق؛ قوربۆق ٢. نێرەکەو 🇮🇷 ١. قورباغه ٢. کبک نَر

**بەق**[2]: ئاوەڵناو. زاق؛ چاوزەق؛ چاودەرپەڕیو 🇮🇷 چشم برجسته

**بەقا** / beqa/: ناو. ١. وەفا؛ ئەمەگ ‹چ قەوماوە بەقات بۆ من نەماوە؟› ٢. دەوام؛ ڕەوتی مانەوە؛ مان ‹بنیشی لە بان تەخت کەیانی / بەقا نەدارۆ ئەی دونیای فانی «ئازادی کەلهوڕی»› ٣. بڕوا ‹تازە چیتر بەقات پێ ناکەم› 🇮🇷 ١. وفا ٢. دوام؛ بقا ٣. باور

▣ **ناوی بەقا**: ئاوی ژیان؛ ئاوێ کە گوایە هەرکەس بیخواتەوە، نامرێ ‹لێوی تۆ ئاوی بەقا، من خدرم/ فەیزی تۆ ڕەحمەت و من سەوزەگیا «نالی»› 🇮🇷 آب حیات

**بەقازانج** / beqazanc/: ئاوەڵناو. بەخێر 🇮🇷 سودمند

**بەقاڵ** / beqał/: ناو. دووکانداری ئازووخەفرۆش 🇮🇷 بقال

**بەقانامە** / beqaname/: ناو. بڕوانامە 🇮🇷 اعتبارنامه

**بەقبەقۆک** / beqbeqok/: دەنگەناو. بلقەبلق؛ دەنگی ئاوێ کە دەکوڵێ 🇮🇷 صدای غُلغُل آب

**بەقبەقو** / beqbeqû/: دەنگەناو. دەنگی قەلەموونە 🇮🇷 صدای بوقلمون

**بەقبەقی** / beqbeqî/: ناو. گۆزەڵەی دەمچکۆلە 🇮🇷 کوزەی دهان‌تنگ

**بەقتاندن** / beqtandin/: چاوگ. تەقاندن 🇮🇷 منفجر کردن

**بەقتین** / beqtîn/: چاوگ. تەقین؛ تەقینەوە 🇮🇷 منفجر شدن

**بەقدەنوس** / beqdenûs/: ناو. جافری؛ جەعفەری؛ مەدەنووس 🇮🇷 جعفری

**بەقلاوە** / beqlawe/: ☜ باقلاوا

**بەقلە** / beqle/: ناو. بۆقلە؛ قەلەموونە؛ بەقلەمووت 🇮🇷 بوقلمون

**بەقلەمووت** / beqlemût/: ☜ بەقلە

**بەقلەوا** / beqlewa/: ☜ باقلاوا

**بەقلیسۆک** / beqlîsok/: ئاوەڵناو. بێشەرم و بێئابڕوو 🇮🇷 بی‌شرم

**بەقم**[1] / beqim/: ناو. ١. کاری سواخ دانی کون و کەلێنی دیوار بە قوڕ ٢. کاری وێران کردن 🇮🇷 ١. گل‌اندود ٢. تخریب

**بەقم**[2]: ئاوەڵناو. ڕەنگ‌هەڵگەڕاو 🇮🇷 رنگ‌باخته

**بەقۆ** / beqo/: ناو. بەقۆک؛ تۆنگە؛ تونگ؛ لوولێنە؛ ئاوخۆرە 🇮🇷 پارچ؛ تُنگ

**بەقۆک** / beqok/: ☜ بەقۆ

**بەقەدر** / beqdr/: ئاوەڵناو. عەزیز؛ خۆشەویست؛ خوەشەویس 🇮🇷 عزیز؛ گرامی

**بەقەدەر** / beqeder/: ئامراز. لەقەدەر؛ بە ئەندازەی 🇮🇷 به مقدارِ

**بەقەم**[1] / beqem/: ناو. ١. دارێکی بەرزی خۆڕسکە بە گوڵی سپی مەیلەو زەردەوە ٢. ڕەنگی وەرگیراو لە داری بەقەم کە بۆ ڕەنگ کردنی

پارچەی ئاوریشم و خوری کەڵکی لێ وەردەگیرێ ٣. ڕەنگێ کە خۆی نەگرێ و زوو کاڵ بێتەوە ‹هەر ڕۆیشتم، هەتاکوو سۆراخی مەراقم گەیاندە ژوورەکەی/ ژووری بوو بەقەم بوو ڕەنگ‌وڕووی «شێرکۆ»› ١. درخت بَقَم ٢. رنگ قرمز بقم ٣. رنگی که زود بپرد

**بەقەم**[٢]: ئاوەڵناو. ١. بێ‌قەول؛ بێ‌بەڵێن ٢. پەیمان‌شکێن ٣. تایبەتمەندی لقی نۆک و دانەوێڵە که لە کاتی دەسکەنە تێپەڕیوە و زوو دەشکێ ١. بدقول ٢. پیمان‌شکن ٣. شکننده (ساقەی خشک جو و نخود رسیده)

**بەقەو** / beqew/: ئاوەڵکار. ١. بە دەنگی بەرز ‹بەقەو بانگی کە!› ٢. بە تەوژمەوە ‹بەقەو پێم لێنێ!› ١. با صدای بلند ٢. با فشار

**بەقەوەت** / beqewet/: ئاوەڵناو. به توان و تابشت؛ خاوەن وزە و هێز توانا؛ نیرومند

**بەقیمەت** / beqîmet/: ئاوەڵناو. نرخدار؛ کوک ‹تازە بە پیری بیر لەو پەندە بەقیمەتە دەکەمەوە و لە دەستم دەرچووە! «هەژار، چێشتی مجێور»› ارزشمند؛ باارزش

**بەقین** / beqîn/: ئاوەڵناو. قیندار؛ قارلەزگ؛ دڵ پڕ لە ڕک کینه‌ورز

**بەقیە** / beqye/: ناو. باقیە؛ باخیە؛ بەخیە؛ تەقەڵ؛ تیک بخیه

**بەکار** / bekar/: ئاوەڵناو. ١. کارا؛ زۆر کارکەر ‹پێکیان هێنا لەشکرێکی چاک/ لە لاوی ئازا و بەکار و چالاک «هێمن»› ٢. بەکەڵک؛ سوودمەند * هەروەها: **بەکار بوون** ١. کارا ٢. بەدردبخور

**بەکارهاتو** / bekarhatû/: ئاوەڵناو. هاوە؛ کێراتی؛ بەکەڵک بەدردبخور

**بەکارهێنراو** / bekarhênraw/: ئاوەڵناو. دەکارکراو؛ کارپێکراو مصرف‌شده؛ مُستعمل

**بەکاکڵ** / bekakił/: ئاوەڵناو. ئازا؛ ناودار؛ پێچەوانەی پووچەڵ مغزدار

**بەکاوەخۆ** / bekawexo/: ئاوەڵکار. هێدی؛ یەواش؛ بە سەبر؛ لەسەرخۆ ‹بەکاوەخۆ دایپۆشی› آرام

**بەکربەگی** / bekirbegî/: ناو. جۆرێ بووزووی ڕێ ـ ڕێ نوعی شال محلی

**بەکرۆک** / bekrok/: ئاوەڵناو. شووفار؛ دووزمان؛ شەیتانی‌کەر سخن‌چین

**بەکرە** / bekre/: ناو. قرقرە؛ غەرغەرە؛ مەکارە قرقره

**بەکرێ‌گیراو** / bek(i)rêgîraw/: ناو. *[پلار]* جاش؛ کرێگرتە؛ خۆفرۆش مزدور؛ عامل بیگانه

**بەکڕ** / bekiř/: ئاوەڵناو. ئامادەی خەوتن لە سەر هێلکە (بالنده) کُرچ

**بەکلکە** / bekilke/: ئاوەڵناو. کلکدار؛ پاشلدار؛ بە دوایی دنباله‌دار

**بەکلکێ** / bekilkê/: ئاوەڵناو. لاوازی لە مردن لاغرمردنی

**بەکوڵ** / bekuł/: ☜ بەرکوڵ[١]

**بەکوڵکە** / bekułke/: ئاوەڵناو. تووکن؛ کوڵکن پشمالو؛ پرمو

**بەکۆ** / beko/: ئاوەڵناو. عومدە؛ زەبەند؛ بە چەند و چۆنییەکی زۆرەوە عُمده

**بەکەل** / bekel/: ئاوەڵناو. بەکەڵک؛ بەکار کارا

**بەکەڵ** / bekeł/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی چێڵ و گامێشی تامەزرۆی جووت بوون گُشن‌خواه

**بەکەڵک** / bekełk/: ئاوەڵناو. بەبەهرە؛ بەفایدە. هەروەها: **بەکەڵک بوون** مفید

**بەکەیف** / bekeyf/: ئاوەڵناو. شاد و دڵخۆش ‹موشتەری وەک من لە مەیخانێ کەمن/ زۆربەیان شاد و بەکەیف و بێ‌خەمن «هێمن»› خوشنود

**بەکەیفی** / bekeyfî/: ناو. دڵخۆشی؛ شادی؛ بەدەماخی شادی

**بەکینە** / bekîne/: ئاوەڵناو. ڕکوونی و بوغز لە زگ

▤ کینەتوز

**بەکێش / bekêş/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ١. بە سەبر و حەوسەلە ٢. قسەدرێژ و قیرسیچمە و درێژدادڕ ▤ ١. صبور ٢. پُرچانه

**بەکێشە / bekêşe/**: ئاوەڵناو. ١. ئاژاوەگێڕ؛ دڕ و شەڕانی ٢. بەهانەگیر؛ پەلپ‌گر؛ لە بەهانە ▤ ١. ماجراجو ٢. بهانه‌گیر

**بەگ[1] / beg/**: ناو. ١. بێگ؛ لەقەمی ئاغاوات ‹تایر بەگی جاف› ٢. یەکەمین کەس لە کایەدا، بەرانبەر قڕە ‹من بەگی!› ▤ ١. بیگ ٢. بازیکن اوّل

**بەگ[2]**: ئاوەڵناو. گەورە ▤ بزرگ

**بەگا / bega/**: ئاوەڵناو. باری زەوی دێراو کە بۆ چاندنی ڕەپستە ئامادەیە ▤ آبسته؛ بسارده

**بەگازندە / begazinde/**: ئاوەڵناو. گلەمەند؛ گازندەکەر ▤ گله‌مند

**بەگاڵتە / begałte/**: ئاوەڵکار. نەڕاستی؛ بە شۆخییەوە ▤ به شوخی

**بەگرتک / begirtik/**: ئاوەڵناو. قالەن؛ ئەستوور؛ قەبە ▤ ستبر

**بەگرێ / beg(i)rê/**: ئاوەڵناو. گرچن ▤ گره‌دار

**بەگزادە / begzade/**: ناو. بەچکە بەگ ▤ بیگ‌زاده

**بەگشتی / begiştî/**: ئاوەڵناو. گەلەمپەری؛ بە گشتی ▤ همگی

**بەگفتولفت / begift û lift/**: ئاوەڵناو. بەدوو؛ دەم‌پاراو؛ لێهاتوو لە قسە کردندا ▤ سخنور

**بەگلەیی / beg(i)leyî/**: ئاوەڵناو. بەگازندە؛ گازندەکەر ▤ گله‌مند

**بەگوان / beg(i)wan/**: ئاوەڵناو. ١. گواندار؛ خاوەن گوان؛ مێوینە ٢. شیردەر؛ شیری؛ توانا لە بەرهەم هێنانی شیر ▤ ١. ماده ٢. شیرده

**بەگوڕ[1] / beguř/**: ئاوەڵناو. ١. ساغ و سەرکەیف ٢. بەهێز؛ بەقەوەت ‹تا هێزی بزووتن لە لەشما بەگوڕ بوو/ من کوڕ بووم بۆ ئاغا و ئاغا باوکی کوڕ بوو «گۆران»› ▤ ١. سرحال ٢. نیرومند

**بەگوڕ[2]**: ئاوەڵکار. بەلەز؛ خێرا ‹هەر کە بزانێ لە شوێنێ من هەم/ بەگوڕ ڕا ئەکا لەم چەم بۆ ئەو چەم «دلدار»› ▤ سریع

**بەگوڕوتاو / beguř û taw/**: ئاوەڵناو. بەهێز و تەکان ‹لافاوی مێژوو بەگوڕوتاوە/ پیس و پڕوپووش دەخاتە لاوە «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ▤ پُرقُدرت

**بەگون / begun/**: ئاوەڵناو. نێری نەخەساو ▤ اخته نشده

**بەگوێ / beg(i)wê/**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* بەلبەلەگۆش؛ گوێڕادێر؛ گۆش‌گیر؛ گوێ‌لەمست ▤ حرف‌شنو

**بەگۆترە / begotre/**: ئاوەڵکار. دەیمی؛ ڕەمەکی؛ هەرەکی؛ هەیکۆ ▤ دیمی

**بەگۆشە / begoşe/**: ئاوەڵناو. سووچدار؛ قولینچک‌دار ▤ گوشه‌دار

**بەگەم / begem/**: ئاوەڵناو. بەکەڵک ▤ مُفید

**بەگەن / begen/**: ناو. پەسند. هەروەها: **بەگەن کردن** ▤ پسند

**بەگیانودڵ / beg(i)yan û dił/**: ئاوەڵکار. گەرم‌وگوڕ ▤ با حرارت

**بەگیر / begîr/**: ئاوەڵناو. خۆڕاگر؛ بەسەبر و پشوودرێژ ▤ صبور

**بەگیرگە / begîrge/**: ئاوەڵناو. ١. بەگیر ٢. نەبەز و کۆڵنەدەر و دەست‌هەڵنەگر ▤ ١. صبور ٢. نستوه

**بەل[1] / bel/**: ناو. پەلە؛ لەز ▤ عجله

⊡ **بەل بوون**: پەل بوون؛ بە پەلە ڕۆیشتن؛ بلەز چوون ▤ با شتاب رفتن

**بەل[2]**: ئاوەڵناو. ١. قەدباریک ٢. لوول و قوت ‹گوێی بەل› ٣. هەڵواسراو؛ شۆڕەوەبوو ٤. درێژ ‹مل› ٥. قیت؛ دەرپەڕیو؛ بڵندتر لە دەوروبەری خۆی ‹گەرچی ڕیشم چەرمگ و دمندانەکانیشم کەلە/ ...ەکەی مردوومراوم ئێستەکەش هەروا بەلە! «شێخ ڕەزا»› ٦. بەرز؛ درێژ ‹مل بەل› ▤ ١. کمرباریک ٢.

پێچدرپیچ و برجسته ٣. آویزان ٤. دراز ٥. برآمده ٦ بلند

◻ **بەل بون:** بەل بوونەوە؛ دەرپەڕین؛ هەڵتۆقین ☰ برجسته شدن

**بەل بونەوە** ☜ **بەل بون**

**بەل**[٢]: پێرۆ. ← تەڕوبەل

**بەلا**[١] / bela/: ☜ بەڵا[١]

**بەلا**[٢]: ناوەڵناو. ١. هار و زیرەک ٢. بلاو؛ پەرژ ☰ ١. آتشپاره ٢. پراکنده

**بەلاتە** / belate/: ناو. کەلاکی منداری حەیوان ☰ لاشەی مردەی حیوان

**بەلاتیتک** / belatîtk/: ☜ پەپوولە

**بەلاتینک** / belatînk/: ☜ پەپوولە

**بەلاتینگ** / belating/: ☜ پەپوولە

**بەلاچیڤانۆک** / belaçîvanok/: ناو. پەپوولـــە؛ پەروانە ☰ پروانه

**بەلازیز** / belazîz/: ناو. ١. گوڵێکی سەرە بەهارە بە ڕەنگی ئاسمان، پنجە و چەند گوڵ دەر دەکا ٢. گوڵەگەزیزە ☰ ١. گلی است نوروزی، آسمانی رنگ ٢. قاصد بهاری

**بەلاش**[١] / belaş/: ناوەڵناو. ١. مفت؛ خۆڕایی؛ بێنرخ ‹وەکوو مەیموون لاساکەرە/ بەلاش گۆشتی سەر چەپەرە «هەژار، *چوار نامیلکە*»› ٢. پووچ و بن شڕ ☰ ١. مفت ٢. یاوه

**بەلاش**[٢]: ناوەڵکار. بە مفت؛ بە خۆڕایی ‹دەرکی سەعبە، دەمەدە مەحوی لە ئەسراری دەمی/ چونکە بۆ «لا شَیءٌ»، هەر سەعییەک بکا دەڕوا بەلاش «مەحوی»› ☰ مُفت؛ مجّانی

◻ **بەلاش و هەلاش:** لەخۆڕا؛ بێهۆ ‹بەلاش و هەلاش ئەو هەموو ڕێگایەت داینە بەر!› ☰ بیهوده

**بەلاڤ** / belav/: ناوەڵناو. بلاو؛ پەرێشان؛ بەلا ☰ پراکنده؛ پریشان

**بەلاڤکەر** / belavker/: ناو. بڵاوکەرەوە ☰ ناشر

**بەلاڤۆک** / belavok/: ناو. پەخشە؛ نووسراوە بۆ بلاو کردنەوە ☰ نشریه

**بەلال** / belal/: ناو. گەنمەشامی؛ گوڵەپێغەمبەرە ☰ بلال

**بەلالوک** / belalûk/: ☜ بلاڵوک

**بەلالیسک** / belalîsk/: ناو. گوڵێکی کوێستانییە ☰ گلی است کوهستانی

**بەلالیک** / belalîk/: ☜ بلاڵوک

**بەلان** / belan/: ناوەڵناو. ١. تەڕەی زەبەلاح ٢. توند و تۆڵ و ئازا ☰ ١. لندهور ٢. چابک

**بەلاوەقە** / belaweqe/: ☜ بەلەباقە

**بەلبەشۆ** / belbeşo/: ناو. ئاژاوە؛ کەس لەکەس ☰ همهمه

**بەلبەلاسینگ** / belbelasîng/: ناو. پەپوولـــە؛ پەرپەڕۆک ☰ پروانه

**بەلبەلەزوانە** / belbelez(i)wane/: ناو. زوکولە؛ زمانە چکۆلە ☰ زبان کوچک

**بەلبەلەشوانە** / belbeleş(i)wane/: ناو. بەلبەلەشوانی؛ بەلبەلەشوانێ؛ زڕەمەندێ؛ زیزڕەمەندێ؛ گیایەکی بۆنخۆشە، گەڵا و لاسکی تووکنە، گوڵی سپی دەر دەکا و تێکەڵ شیرێژی دەکەن ☰ گیاهی خوراکی

**بەلبەلەشوانی** / belbeleş(i)wanî/: ☜ بەلبەلەشوانە

**بەلبەلەشوانێ** / belbeleş(i)wanê/: ☜ بەلبەلەشوانە

**بەلبەلەگۆش** / belbelegoş/: ناوەڵناو. بەگوێ؛ گوێڕادێر ☰ حرف‌شنو

**بەلبەلیتانگ** / belbelîtang/: ☜ پەپوولە

**بەلبەلیناتگ** / belbelînatig/: ☜ پەپوولە

**بەلبەنی** / belbenî/: ناو. دۆڕاخ ☰ گیاهی است

**بەلچم** / belçim/: ناو. گەڵا و لکی زۆر ناسکی دار ☰ شاخەی ریز و نازک درخت

**بەلشاندن** / belşandin/: چاوگ. هەمان دان ⇆ تحریک کردن

**بەلشین** / belşîn/: چاوگ. تێکەوەگلان؛ پێکهەڵپڕژان ⇆ گلاویز شدن

**بەلفاندن** / belfandin/: چاوگ. خلافاندن؛ خاپاندن؛ فێڵ و تەڵەکە لێکردن ⇆ گول زدن

**بەلقاندن** / belqandin/: چاوگ. بلقەبلق کردن ⇆ غُلغُل کردن آب

**بەلقتاندن** / belqitandin/: چاوگ. ١. قەلاشتن؛ قەڵشاندن ٢. پارچە ـ پارچە کردن ⇆ ١. شکافتن ٢. قطعە ـ قطعە کردن

**بەلقتین** / belqitîn/: چاوگ. بەرقتین؛ بەلقەتین: ١. قەڵشان؛ تلیشیان ٢. پارچە ـ پارچە بوون ⇆ ١. شکافتە شدن ٢. قطعە ـ قطعە شدن .

**بەلقەتین** / belqetîn/: ☜ بەلقتین

**بەلک** / belk/: ناو. نەرمەگوێ؛ جێ گوارە ⇆ نرمەی گوش

**بەلکانک** / belkanik/: ناو. باڵداریکە ⇆ پرندەایست

**بەلگ** / belg/: ناو. لەرزانە؛ جۆرێ خشڵی ژنان کە وەک گەلاداری دەکەن ⇆ زیوری زنانە

**بەللی** / bellî/: ناوەڵکار. [پلار] فڕ؛ بەڵێ (بە گاڵتەوە، واتا: هیچێکی وا نییە) ⇆ صد البتە (با تمسخُر)

**بەلمیت** / belmît/: ناو. مۆم؛ شەم ⇆ شمع

**بەلنگاز** / belingaz/: ناوەڵناو. بەلەنگاز؛ هەژار ‹دیا منا بەلنگاز پێنجی سالێ دلۆڤان/ سالەک پشتی باڤێ من، ئەڤ ژی ل ڤێ بوو مێڤان «جگەرخوێن»› ⇆ بینوا

**بەلوغە** / beluğe/: ناو. شێر؛ موسلوخ ⇆ شیر آب

**بەلوەشێن** / belweşên/: ناو. ١. نەخۆشی گران ٢. گولی ⇆ ١. بیماری سخت ٢. جُذام

**بەلۆ** / belo/: ناو. لەقەمی گورگ ⇆ لقب گرگ

**بەلۆڤاژی** / belovajî/: ناوەڵناو. بەراوەژی ⇆ وارونە

**بەلۆق** / beloq/: ناوەڵناو. ترووسکەدار؛ بەبریقە ⇆ درخشندە

**بەلۆک** / belok/: ناوەڵناو. زمانشڕ ⇆ بددهن

**بەلۆکە** / beloke/: ناو. بلیکە؛ بەلووکە؛ بەلەمیتکە؛ بەلە؛ قیتکە؛ چووچەڵە؛ نێوەر؛ چیلکە؛ دوو پەلەگۆشتێ لای سەرووی ئەندامی زاوزێی گوانداری مێ ⇆ چوچولە

**بەلو** / belû/: ناو. بەڕوو؛ بەری دار بەڕوو ⇆ بلوط

**بەلوتنەک** / belûtnek/: ناو. پیک؛ پیق؛ فیقەنە ⇆ زبانەی سر سرنا

**بەلوجە** / belûce/: ناو. گیایەکە وەک ئەسپۆن کەف دەکا ⇆ گیاهی مانند اشنان کف می‌کند

**بەلوچکە** / belûçke/: ناو. بەلووجە؛ بەڕوولە؛ خڕەداری چکۆلە و کورت کە دەچێ بە نێو دوو داری کونکراودا بۆ توند کردن وەک بەڕوولەی بەین دەند و پاشبارە لە ئامووردا، هەروەها لە کانزاش چێ دەبێت ⇆ پیم؛ میلەی مخروطی

**بەلوچە** / belûçe/: ناو. بەڕوولەی ئاموور ⇆ از ابزار خیش

**بەلوعە** / belû'e/: ناو. موسلوخ؛ شێری ئاو ⇆ شیر آب

**بەلوکە** / belûke/: ☜ بەلۆکە

**بەلووەر** / belûwer/: ناو. گۆزە ⇆ کوزە

**بەلویی** / belûyî/: ناو. زۆلوولاو؛ ڕوەکێکی لامژە، ڕیشەی لە سەر داری بەڕوو دەڕوێ و میوەکەی بۆ ڕەوانی باشە ⇆ دارواش

**بەلە**[١] / bele/: ☜ بەلۆکە

**بەلە** [٢]: پێشوشە. لە پێش وشەدا دێ و مانای قوت و قنج دەدا بە وشەکەی دیکە ‹بەلەزمانە› ⇆ ـ ور؛ برجستە

**بەلەباریک** / belebarîk/: ناوەڵناو. قەدزراو؛ قەدباریک؛ بەلەباریکە ⇆ باریک‌اندام

**بەلەباریکە** / belebarîke/: ☜ بەلەباریک

**بەلەباقە** / belebaqe/: ناو. بەلاوەقە؛ نەخۆشییەکی بزنە ‹بزن و مەڕ رووتن، وەک سوورەباقە/ یەک دانوو دەیکوشت یەک بەلەباقە «سەیفی قازی»› ☰ از بیماری‌های بُز

**بەلەبۆر** / belebor/: ناو. مەڕی ڕەنگ بۆری گوێڕاست و درێژ ☰ گوسفند کبود

**بەلەبۆز** / beleboz/: ناو. *[کینایە]* لەقەمی گورگ ☰ از القاب گرگ

**بەلەبەش** / belebeş/: ناو. بزنی ڕەشی نێوچەوان سپی ☰ بُز سیاه پیشانی سفید

**بەلەپا** / belepa/: ئاوەڵناو. بەپا؛ چالاک؛ خۆشڕەو؛ لەزگین؛ خاوەن پل‌وپای توند و خێرا ☰ تیزپا

**بەلەتووڕکە** / beletûřke/: ناو. بەلەفیرە؛ تەقەفیرە ☰ اسهال

**بەلەچ** / beleç/: ☜ **بلچ**

**بەلەچە** / beleçe/: ناو. ١. لەرە؛ لەرزە ٢. کەلەپچە ☰ ١. لرزش ٢. دستبند زندانی

**بەلەچەق** / beleçeq/: ☜ **بەلەچەك**

**بەلەچەک**[١] / beleçek/: ناو. بەلەچەق: ١. تاسمە؛ کوولەکەی وشک کراو بۆ زستان ٢. کەلەپچە؛ دستبەندی بەندی ☰ ١. کدوی خشک کرده ٢. دستبند زندانی

**بەلەچەک**[٢]: ئاوەڵناو. بەلەچەق؛ هەڵواسراو؛ بە تەکەتەک ☰ آویزان

**بەلەخەت** / belexet/: ناو. کووز؛ تۆمەشان ☰ خطِ تعیین شخم

**بەلەدی** / beledî/: ناو. تروسکەی برووسکەی ئاسمان ☰ درخشش برق

**بەلەریقە** / belerîqe/: ناو. بەلەفیرە ☰ اسهال

**بەلەز**[١] / belez/: ئاوەڵناو. بلەز؛ پەلە ‹کاری بەلەز› ☰ عجله

**بەلەز**[٢]: ئاوەڵکار. بلەز؛ بەپەلە ‹بەلەز هات› ☰ با عجله

**بەلەزخۆر** / belezxor/: ئاوەڵناو. بەدەم؛ زۆرلەوەڕ ☰ تُندخور

**بەلەزمانە** / belez(i)mane/: ناو. زمانەچکۆلە ☰ زبان کوچک

**بەلەزواد** / belez(i)wad/: ناو. ئاغزوونە ☰ سگک

**بەلەزوانە** / belez(i)wane/: ناو. بەلەزمانە ☰ زبان کوچک

**بەلەزەت** / belezet/: ئاوەڵناو. خۆش‌چێژ؛ خۆش‌تام ☰ لذیذ

**بەلەزی** / belezî/: ☜ **پەلەپڕوزێ**

**بەلەژنانێ** / belej(i)nanê/: ☜ **بەلەکناچێ**

**بەلەسوور** / belesûr/: ناو. کەڵەکێوی ئامال‌سوور ☰ بُز کوهی مایل به قرمز

**بەلەسە**[١] / belese/: ناو. پەلە؛ لەز؛ پەل ☰ عجلە؛ شتاب

⊡ **بەلەسە بوون**: وە پەلە کەوتن ☰ شتاب کردن

**بەلەسە**[٢]: ئاوەڵناو. ١. ئاوارە؛ دەربەدەر؛ ڕەبەن ٢. سەرکێش؛ سەربزێو؛ لاسار؛ یاخی ‹هەسپی بەلەسەم/ بەتالووکەیە بالی لێم دەوێ/ شەو تا بەیانی زرمەی نالی دێ و چەخماخە دەدا/ نە من دەسرەوم، نە ئەو دەسرەوێ «پەشێو»› ☰ ١. آواره ٢. سرکش؛ یاغی

⊡ **بەلەسە بوون**: دانە دەشت و غەزرین ☰ آوارەی کوه و صحرا شدن

**بەلەسەیی** / beleseyî/: ناو. لەزاهی؛ پەلەیی؛ هەڵپە ☰ شتاب؛ عجله

**بەلەشوانە** / beleşiwane/: ناو. گیایەکی کوێستانە ☰ گیاهی کوهی

**بەلەشین** / beleşîn/: ناو. ١. *[مەجاز]* لەقەمی گورگ ٢. بزنەکێوی ئامال شین ☰ ١. از القاب گرگ ٢. بُز کوهی مایل به کبود

**بەلەفیرە** / belefîře/: ناو. ١. بەلەریقەی ئاژەڵ ٢. *[کینایە]* تەقەفیرە؛ ڕەوانی ☰ ١. اسهال دام ٢. اسهال

**بەلەفیرێ** / belefîřê/: ناو. بەلەفیرە؛ تەقەفیـرە 🇮🇷 اسهال دامی

**بەلەڤاژی** / belevajî/: ئاوەڵناو. بـەراوەژوو؛ واژی؛ ئاوەژوو 🇮🇷 واژگون

**بەلەک**[1] / belek/: ناو. ١. پـووز؛ لەتـەر؛ نێـوان قولەقاپ و ئەژنۆ ‹کچی لـەباری ڕەوەنـد/ هەڵـیکرد بەلـەک و زەنـد «هـێمن»› ٢. بـەلیک؛ بـەلێک؛ بەلیـەک؛ مێکـووک؛ شـیرینبەلـەک؛ گیایـەکی خوڕسکە گەڵاکانی پان و چکۆلەیە و گوڵـەکانی شینە و دەنکی میوەکەی ڕەشی مەیلەو قاوەییە 🇮🇷 ١. ساق پا ٢. گیاه شیرین‌بیان

**بەلەک**[2]: ئاوەڵناو. ١. ئەیاغ؛ چـرووک و بـێنـرخ ٢. تایبەتمەندی ئاژەڵـێ کـە پـەڵێکی سـپییە 🇮🇷 ١. بُنجُل، نامرغوب ٢. ویژگی دامی که یک پایش سـفید است

**بەلەکئەستور** / belek'estûr/: ئاوەڵناو. قیـپ 🇮🇷 ساق‌کلفت

**بەلەکانەک** / belekanek/: ناو. کوند 🇮🇷 جُغد

**بەلەکبردێن** / belekbirdên/: ئاوەڵناو. ڕەنگاوڕەنگ 🇮🇷 رنگارنگ

**بەلـەکبردێنی** / belekbirdênî/: نـاو. کـاری ڕەنگاندن؛ ڕەنگین کردن 🇮🇷 رنگ‌کاری

**بەلـەکپێچ** / belekpêç/: نـاو. دۆلاغ؛ پووزەوانـە؛ ساق‌پێچ 🇮🇷 ساق‌پیچ

**بەلـەکناچێ** / belek(i)naçê/: ئاوەڵناو. بلـەکناچێ؛ بەلەژنانێ؛ ژنانیلە؛ ژنیلانە؛ ئاغەباجی (بۆ کوڕی بـە خوو و خدە کچ دەگوترێ) 🇮🇷 زن‌نما

**بەلـەگ** / beleg/: نـاو. ١. سـەرمایە ٢. شـێوەی بەرگ پۆشین 🇮🇷 ١. سرمایه ٢. طرز پوشش

**بەلەگەور** / belegewr/: ئاوەڵناو. نەهاتی؛ نەگبـەتی 🇮🇷 نکبت

**بەلەم** / belem/: نـاو. ١. قایق؛ لۆتکە ‹سەرت لە ناو تەنیاییـدا/ بەلـەمێکی سـەرگەردانە و/ دەسـتەکانت: سەوڵـی شـکاو «شـێرکۆ»› ٢. دەفـری گـەورە بـۆ چێشتی گرار 🇮🇷 ١. قایق ٢. بشقاب بزرگ پلو

**بەلـەمئاژۆ** / belem'ajo/: ناو. قایقەوان؛ لۆتکـەوان؛ ئاژۆری بەلەم 🇮🇷 قایقران

**بەلەمرک** / belemirk/: ناو. ئانیشک 🇮🇷 آرنج

**بەلەمکێش** / belemkêş/: ناو. پاپۆڕەی موتوری بـۆ کێشانی پاپۆڕی تر 🇮🇷 یدک‌کش

**بەلەمیتکە** / belemîtke/: ☜ **بەلۆکە**

**بەلەمیزکە** / belemîzke/: ☜ **بەلەمیسکە**

**بەلەمیسکە** / belemîske/: نـاو. بەلەمیزکـە: ١. میزەچرکە؛ چرکـەمیزە؛ میزەچورتکـە ٢. *[مەجاز]* شۆڕاوەی کەمی تراو 🇮🇷 ١. چکمیزک ٢. ریزش کم مایعات

**بەلەنجەولار** / belence w lar/: ئاوەڵناو. شـەلەنگ؛ قەدباریک و پێکەوتوو 🇮🇷 خرامان

**بەلەندیر** / belendîr/: ناو. بـەردیل؛ شـەکی بـەر بەران 🇮🇷 گوسفند سه بهار دیده

**بەلەنـدیربڕ** / belendîrbiř/: نـاو. کـاوڕە مێـی دووساڵە کە کاتی بڕینەوەی گەیشتووە 🇮🇷 گوسفند دوساله که وقت پشم چیدنش رسیده باشد

**بەلەنگاز** / belengaz/: ئاوەڵناو. بـەلنگاز؛ بلـەگاز؛ بەستەزمان؛ بێچارە؛ نەدار ‹رزا رابـە جیهـان بوویـە سـەرفراز/ د دنیـا مانـە تـەنێ ئـەم بەلـەنگاز «جگەرخوێن»› 🇮🇷 بینوا

**بەلەنگازی** / belengazî/: ناو. هەژاری؛ نـەداری 🇮🇷 بینوایی

**بەلەوڕن** / belewiren/: ناو. بزنەکێوی دوو تا سێ ساڵە 🇮🇷 قوچ کوهی دو تا سه ساله

**بەلی**[1] / belî/: ناو. ١. بەلێ؛ ئارێ ٢. بەڕی؛ بـەلوو؛ بەڕوو ٣. دۆخی بەل بـوون 🇮🇷 ١. بلـی ٢. بلـوط ٣. حالت برآمده بودن

**بەلی**[2]: ئاوەڵناو. خویا؛ دیار؛ لەبەرچاو 🇮🇷 آشکار

**بەلیانـدن** / belyandin/: چـاوگ. دامەزرانـدن؛

جێگیر کردن 🇮🇷 قرار دادن

**بەلیتانک / belîtanik/**: ☜ **پەپولە**

**بەلیتانگ / belîtang/**: ☜ **پەپولە**

**بەلیسە / belîse/**: ناو. چلوورە؛ زەمبلە؛ قەندیل 🇮🇷 دنگالە

**بەلینا / belîna/**: ناو. ماسیی گەورە 🇮🇷 ماهی بزرگ

**بەلیەک / belyek/**: ☜ **بەلەك**

**بەڵ / beł/**: ئاوەڵناو. زۆر گەیشتووی نەرم بوو 🇮🇷 بسیار رسیده و شُل

**بەلا¹ / beła/**: ناو. بەلا؛ بلا؛ چۆرتم؛ چەترمە؛ چەل؛ قەترمە؛ لەترمە؛ وەیشووم؛ وەیشوومە؛ ئاتاف؛ قەزا؛ نەقازە؛ قۆرت؛ قسپ؛ گرگاشە؛ تەرن؛ نسیبەت؛ بلێشە؛ دومات؛ نەرد؛ نەهامەتی؛ ئەنگەمە؛ مەرشە؛ بێتار؛ ئاپۆر؛ مسۆدە؛ هەر جۆرە بەسەرهاتی ناخۆش و زیان‌دەر ‹بەلا وە پەل‌وپووش ئەگەڕێ! «مەسەل»› 🇮🇷 بلا

⊡ **بەلای لابەلا:** گیر و گرفتی لەناکاوی دژوار 🇮🇷 بلای ناگهانی

**بەلای بەلاتە:** دەردی بێ‌دەرمان 🇮🇷 درد بی‌درمان

**بەلا²:** ئامراز. بەلام؛ ئەمما 🇮🇷 امّا

**بەلابەسەرهاتوو / bełabeserhatû/**: ئاوەڵناو. داخدیە؛ داغدیە 🇮🇷 داغدیده؛ بلادیده

**بەلاجەوی / bełacewî/**: ئاوەڵناو. سەیر؛ سەمەرە 🇮🇷 عجیب

⊡ **بەلاجەوی لێ هاتن:** واق‌وڕ مان؛ پێ سەیر و سەمەرە بوون 🇮🇷 متعجب شدن

**بەلاگەردان / bełagerdan/**: ناو. بالاگەردان؛ بەلاگێڕ؛ بەلاوەگێڕ؛ قەزاگر؛ قوربان؛ قەزاگێڕەوە؛ هۆ و هۆکاری بەلا و مەینەت دوورکەرەوە ‹بەلاگەردانی بالات بم، ئەگەر چووم/ فیدای هیندوویی خالت بم، ئەگەر مام «نالی»› 🇮🇷 بلاگردان

**بەلاگێڕ / bełagêř/**: ناو. ١. ☜ **بەلاگێڕەوە** ٢. ☜ **بەلاگەردان**

**بەلاگێڕەوە / bełagêřewe/**: ناو. بەلاگێڕ؛ قەزاگێڕەوە؛ بەلاگێڕ 🇮🇷 بلاگردان

**بەلالۆک / bełałûk/**: ☜ **بلاڵوک**

**بەلام / bełam/**: ئامراز. بەلان؛ بەلا؛ بلام؛ ئەمما ‹بەلام ژین هەر هەوەس نییە/ جوانیش بە تەنێ بەس نییە «هێمن»› 🇮🇷 امّا

**بەلامک / bełamik/**: ناو. بزمک؛ زاربێنی بێچووی ئاژەڵ 🇮🇷 دهان‌بند بچه‌ی شیرخوار حیوان

**بەلان / bełan/**: ئامراز. بەلام 🇮🇷 لکن

**بەلاو / beław/**: ☜ **بلاو**

⊡ **بەلاو کردنەوە** ☜ **بلاو کردنەوە**

**بەلاوە / beławe/**: ☜ **بلاوە**

⊡ **بەلاوە پێکردن** ☜ **بلاوە پێکردن**

**بەلاوە کردنەوە** ☜ **بلاوە کردنەوە**

**بەلاوەگێڕ / beławegêř/**: ☜ **بەلاگەردان**

**بەڵبوگ / bełbûg/**: ئاوەڵناو. دەڵ‌وبەڵ؛ نەرمی نزیک بە ڕزیو (میوە) 🇮🇷 نرم شده در مرز گندیدگی

**بەڵتە / bełte/**: ناو. تەور؛ ئامرازی دار برین 🇮🇷 تبر

**بەڵجەم / bełcem/**: ناو. گەڵا 🇮🇷 برگ

**بەڵخ / bełx/**: ناو. ١. بەڵغ؛ کەڕوو؛ بڕش ٢. بڵخ 🇮🇷 ١. کپک ٢. دُردی

⊡ **بەڵخ کوچک** کرێژەبەرد؛ خەنەگورگە؛ گڵەوەز؛ خەنەتیکلە؛ قرێژەبەرد؛ گەڵەبەردیلە؛ بیرۆبەرتک؛ خەبەردیلە 🇮🇷 گُلسنگ

**بەڵخە / bełxe/**: ناو. یەکانە؛ نێرەبەراز؛ بەرەک 🇮🇷 گُراز نر

**بەڵخەم / bełxem/**: ☜ **بەڵغەم**

**بەڵشاندەر / bełşander/**: ئاوەڵناو. هاندەر؛ دنەدەر 🇮🇷 مُحرک

**بەڵغ / bełğ/**: ☜ **بەڵخ ـ١**

**بەڵغگر / bełğgir/**: ناو. جرمگر 🇮🇷 جِرمگیر

**بەڵغەم / bełğem/**: ناو. بڵخەم: ١. خڕین؛ بەڵخەم؛ تفلیک؛ ڕیمی خەستەوەبووی بن کەپۆ

کە زۆربەی لە دەمەوە تف دەکرێتەوە ٢. یەک لە چوار خڵتی سەرەکی لەش، بە پێی بژیشکی کۆنەوە (سێ تریان: خوێن، سەفرا، سەودا) ☰ ١. خلط سینە ٢. بلغم؛ یکی از چهار طبع

**بەڵغی / belğî/**: ناو. سەرەتای چنینی تەون ☰ ابتدای قالیبافی

**بەڵک / belk/**: ☜ بەڵکو

**بەڵکا / belka/**: ☜ بەڵکو

**بەڵکان / belkan/**: ناو. کەنگەر؛ قنگر؛ کنگر ☰ کنگر

**بەڵکم / belkim/**: ☜ بەڵکو

**بەڵکو[1] / belkû/**: ئاوەڵکار. بەڵک؛ بەڵکا؛ بەڵکم؛ بەڵکەت؛ بەڵکەتانێ؛ بەڵکەتێ؛ بەڵکەم؛ بەڵکەن؛ بەڵکی؛ بەڵکین؛ بەڵکینا؛ بەڵکینێ: ١. بەشکەم؛ بەشکوو؛ بەشکم؛ دەشکەم؛ دەشقەم؛ بەشقەم؛ بەشکی؛ بەشکێکۆ؛ بەشکا؛ بەشکێکم؛ بەشقا؛ شایەتا؛ تەکوو ‹هەموو شەو چاوەڕێم بەڵکوو بە مەخفی یاری گیانی بێ/ لە تاریکی شەوا شوعلەی چرا موشکڵ نهانی بێ «سالم»› ٢. زیاد لەوە؛ لەوە بەولا؛ تازە ‹نەک هەر پارەی نەسەند، بەڵکوو پارەیەکیشی دا› ☰ ١. بلکە؛ شاید ٢. بە علاوە

**بەڵکو[2]**: ئامراز. بەڵک؛ بەڵکا؛ بەڵکم؛ بەڵکەت؛ بەڵکەتانێ؛ بەڵکەتێ؛ بەڵکەم؛ بەڵکەن؛ بەڵکی؛ بەڵکین؛ بەڵکینا؛ بەڵکینێ: ١. یا خودا؛ بەشکوو؛ بەشکەم؛ بەشقا؛ ڕەببی؛ هیوایە ‹بەڵکوو وا بێ› ٢. زیاد لەوە؛ نەک هەر ئەوە؛ تەنانەت؛ تەنانە؛ حەتتا ‹لە حەسرەت سەروی قەددت چاوی نالی/ دوو جۆگە بەڵکوو دوو ڕووبارە بێ تۆ «نالی»› ☰ ١. بلکە ٢. حتی

**بەڵکە / belke/**: ☜ بەڵکو

**بەڵکەت / belket/**: ☜ بەڵکو

**بەڵکەتانێ / belketanê/**: ☜ بەڵکو

**بەڵکەتێ / belketê/**: ☜ بەڵکو

**بەڵکەم / belkem/**: ☜ بەڵکو

**بەڵکەن / belken/**: ☜ بەڵکو

**بەڵکی / belkî/**: ☜ بەڵکو

**بەڵکین / belkîn/**: ☜ بەڵکو

**بەڵکینا / belkîna/**: ☜ بەڵکو

**بەڵکینە / belkîne/**: ناو. زمانە چکۆلە؛ بەلەزوانە ☰ زبان کوچک

**بەڵکینێ / belkînê/**: ☜ بەڵکو

**بەڵگ / belg/**: ناو. ١. پەڕەی گوڵ ٢. گەڵا؛ پەلک ٣. پێلوو؛ پەلکی چاو ٤. نەرمێنەی گوێچکە ☰ ١. گل برگ ٢. برگ ٣. پلک چشم ۴. نرمەی گوش

▣ **بەڵگی گوێ** نەرمەی گوێ ☰ نرمەی گوش

**بەڵگاژۆ / belgajo/**: ☜ **بەرگاژۆ**

**بەڵگوبن / belg û bin/**: ئاوەڵناو. شرت و گوم ☰ گم و گور

**بەڵگە / belge/**: ناو. ١. نیشان لە گوم بوو ٢. نیشانە؛ سەنەد ‹لالام و نالام حاشای موشکڵەن/ گیان فیدای تۆ بۆ، یە بەڵگەی دڵەن «مەولەوی»›. هەروەها: **بەڵگە هێنانەوە** ☰ ١. رد گم شده ٢. سَنَد؛ مدرک

**بەڵگەدار / belgedar/**: ئاوەڵناو. بەبەڵگە؛ بەڵگەوەر ‹وڵامێکی بەڵگەداری پێ نەبوو› ☰ مُستند

**بەڵگەنامە / belgename/**: ناو. ١. بڕوانامە؛ بەڵگەی فەرمی گوزارشی ڕاستییەک لە مەڕ کەسێ یان شتێکەوە ‹بەڵگەنامەی تەندروستی› ٢. بەڵگە؛ سەنەد ‹هەولێر لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی بریتانیادا› ☰ ١. گواهینامە ٢. سَنَد

**بەڵگەوەر / belgewer/**: ☜ **بەڵگەدار**

**بەڵم[1] / belm/**: ناو. ١. کای برنج و هەرزن ٢. بەهانە؛ بیانوو ☰ ١. کاه شالی و ارزن ٢. بهانە

**بەڵم[2]**: ئاوەڵناو. پانوپۆڕ؛ هەڵمساو و قەبە ☰ پف‌آلود و بادکردە

**بەڵم[3]**: ئامراز. وشەی وەڵام دانەوەی بە تووڕەیی و قەڵسییەوە ☰ پاسخ از سر عصبانیت

**بەڵمەبر** / belmebir/: ناو. تفەنگێ لە دواوە باروت و پەڕۆی تێبخرێ ≡ تفنگ تەپر

**بەڵمەڕیشە** / belmeřîşe/: ناوەڵناو. [پەلار] ڕیش پان و پف ≡ ریش پهن

**بەڵمەگۆشت** / belmegoşt/: ناو. چێنێ؛ پارچەیەک لە گۆشت ≡ لُخمه گوشت

**بەڵمێ** / belmê/: ☜ **بەللی**

**بەڵەبڵ** / belebil/: ناوەڵناو. [پەلار] چەقەسرۆ؛ چەنەباز؛ زۆربڵێ؛ فرەوێژ ≡ وراج

**بەڵەتین** / beletîn/: ناو. پەتێکی باریکە لە مووی بزن دروستی دەکەن بۆ بەستنەوەی گوێلک و کاژیلە و قایم کردنی ڕەشماڵ ≡ ریسمان بافته شده از موی بُز

**بەڵەد** / beled/: ناوەڵناو. بەڵەگ؛ بەڵەڵ: ١. شارەزا؛ ڕێزان (نەفی و ئیسباتە کە زیکری ڕێ بە حەق نیشان ئەدا/ وا منیش ڕێبواری ئەو ڕێیەم خودا بمکەی بەڵەد «بێخود») ٢. ڕێنوێن * هەروەها: **بەڵەد بوون** ≡ ١. آگاه ٢. راهنما

**بەڵەدی** / beledî/: ناو. شارەزایی ≡ بلدی

**بەڵەک** / belek/: ناوەڵناو. ١. دوورەنگ؛ بازگ؛ بازوو؛ بازی ٢. تووشی نەخۆشی بەڵەکی ≡ ١. چپار ٢. مبتلا به بیماری بَرَص

**بەڵەکی** / belekî/: ناو. ١. دوورەنگی؛ بازگی ٢. نەخۆشییەکە پێست پەڵە ـ پەڵە دەکا ≡ ١. ابلقی ٢. بَرَص پوست

**بەڵەگ** / beleg/: ☜ **بەڵەد**

**بەڵەڵ** / belel/: ☜ **بەڵەد**

**بەڵیاندن** / belyandin/: چاوگ. ڕازی کردن؛ قانع کردن ≡ راضی کردن

**بەڵێ**[1] / belê/: ناو. ئەرێ؛ بەرێ؛ لەبێ؛ پەرسفی ئەرێنی و پەسند کەرەوە ≡ بلی؛ آری

**بەڵێ**[2]: ناوەڵکار. بەرێ؛ بڵەڵ: ١. ئەرێ؛ ئا؛ ئەدی؛ نیشانەی هاوبیری ٢. ڕاستە؛ ڕاسا؛ وایە؛ بۆچی؛ پاسەنە؛ نیشانەی چەسپاندن (حەیاتی من ویسالی تۆ، مەماتی من فیراقی تۆ/ بەڵێ پەریی خەیالی تۆ، عیلاجی شێت و هار ئەکا «بێخود») ≡ ١و٢. بلی

**بەڵێ**[3]: دەنگ. هۆبەڵێ؛ بەرێ؛ هەو؛ هەوبەڵێ؛ وشەیەک کە بیسەر بۆ ڕاگەیاندنی ئامادە بوونی ئێژێ ≡ بلی

**بەڵێبەڵێ** / belêbelê/: ناوەڵکار. هەرێهەرێ؛ ئاخۆ وابوو ≡ عبارت تأیید انکاری

**بەڵێن** / belên/: ناو. قەوڵ؛ پەیمان؛ سۆز (چڵکی دەستە ماڵی دنیا، وەک دەڵێن/ ماڵپەرست پەیمانشکێنە و بێ بەڵێن «هێمن») ≡ عهد؛ پیمان

⊡ **بەڵێن دان**: قەول دان؛ سۆز دان ≡ قول دادن

**بەڵێندار** / belêndar/: ناوەڵناو. دەڤبگۆتن؛ قەبال؛ پەیمانڕاگر ≡ درستپیمان

**بەڵێندەر** / belênder/: ناو. قەوڵدەر ≡ پیمانکار

**بەڵێننامە** / belênname/: ناو. نامە و نووسراوەیەک بەڵێنی جێبەجێ کردنی کارێکی تێدا دراوە ≡ پیماننامه

**بەڵێی** / belêy/: ☜ **باڵێ**[3]

**بەم**[1] / bem/: ناوەڵناو. ١. تایبەتمەندی دەنگی قەبە و زبر ٢. درشت و قەبە (زۆرتر بۆ بار) ≡ ١. بم ٢. بزرگ و جاگیر

⊡ **بەم بوون**: زبر و درشت بوون ≡ زبر شدن؛ زمخت شدن (در مورد صدا)

**بەم**[2]: ئامراز. [سووکەڵە] بە ئەم (بەم نیوەشەوە بۆ کوێ دەڕۆی؟) ≡ بدین

**بەمبوولە** / bembûle/: ناوەڵناو. فێڵباز؛ دەسبڕ؛ حیلەباز ≡ ناروزن

**بەمزگێنی** / bemizgênî/: ناوەڵناو. خۆشخەوەر؛ مژدەهێن ≡ خوشخبر

**بەمشوور** / bem(i)şûr/: ناوەڵناو. قایمەکار؛ قایمکار ≡ مُدبر

**بەمشووری** / bem(i)şûrî/: ناو. قایمەکاری؛

قایمکاری 🇮🇷 مُحکم‌کاری

**بەمۆر و مایە / bemor û maye/**: ئاوەڵناو. [مەجاز] لەخۆبایی 🇮🇷 مغرور

**بەمۆنج / bemonc/**: ئاوەڵناو. شەپۆلاوی؛ شەپۆلدەر؛ بەپێل 🇮🇷 موجدار؛ مواج

**بەمو[1] / bemû/**: ئاوەڵناو. بە کوڵکە؛ موودار 🇮🇷 پشمالو

**بەمو[2]**: ئاوەڵکار. زۆر کەم ‹بەموو لێی ترازام› 🇮🇷 بسیار کم

**بەمە / beme/**: ئامراز. [سووکەڵە] بە ئەمە ‹بەمە گەمە دەکا!› 🇮🇷 با این

**بەمەرج / bemerc/**: ئاوەڵناو. مەرجدار 🇮🇷 مشروط

**بەمێر / bemêr/**: ☜ بەمێرد

**بەمێرد / bemêrd/**: ئاوەڵناو. بەمێر؛ شوودار؛ بە شوو 🇮🇷 شوهردار

**بەن[1] / ben/**: ناو. ١. هەوداى لە خورى و موو ‹بەنی دەسرازەت خوری شەکی کاڵ/ دابەستەی کوێستان چراگای سەر یاڵ «قانع»› ٢. بەند؛ هەرچی شتی پێ دەبەستن ٣. گرێ و فێڵ ٤. دەوروبەری ئاوایی ٥. گیایەکی کوێستانییە ٦. دار قەزوان 🇮🇷 ١. نخ ٢. بند ٣. نیرنگ ۴. حریم روستا ۵. گیاهی است ۶. درخت بُنه

▣ **بەن دڵ**: [کینایە] بەندی دڵ؛ خۆشەویست و ئازیز 🇮🇷 محبوب

**بەن جگەر**: [کینایە] فرزەند 🇮🇷 بند جگر؛ فرزند

▣ **بەن با دان**: [کینایە] داو بادان؛ دەرەقەت هاتن ‹بەلام محەمەدی لەو کەسانە نەبوو کە ئەم جۆرە قەلە و قوتانە بەنی با بدەن و بە بەگلەرێک و دوان و سییان و دەیانیش بگیرێ «هەژار، شەرەفنامە»› 🇮🇷 مغلوب کردن

**بەن دڵ بڕیان**: [مەجاز] دڵ داکەوتن 🇮🇷 بند دل پاره شدن

**سەر بەنێ گرێ دان**: [کینایە] گۆشەی کارێ گرتن؛ کارێکی کەمیش بووە، کردن 🇮🇷 سر کاری را گرفتن

**بەن[2]**: ئاوەڵناو. وێستاو؛ ماوەوە 🇮🇷 راکد؛ بسته

▣ **بەن بوون**: ١. مانەوە؛ نەڕۆیشتن ‹لە هیچ شوێنێک بەن نابێ› ٢. وەستان؛ گیر بوون ‹ئەم کۆڵە لە قەی ئەو بارەوە بەن نابێ› 🇮🇷 ١. ماندگار شدن ٢. بند شدن

**- بەن[3]**: پاشەوشە. ١. بێن؛ وێن؛ ببەن؛ هۆ یا ئامرازێ بەستن ‹کەمەربەن› ٢. لەبار بۆ بەستن ‹گەردنبەن› ٣. بەستراو ‹پابەن› 🇮🇷 ١تا٣. ـ بند

**بەنا / bena/**: ناو. ١. وەستاکاری ماڵ کردنەوە ٢. گیایەکی خواردەمەنی بەهارانە 🇮🇷 ١. بنّا ٢. گیاهی است کوهی

▣ **بەنا ڕۆمی**: تاوڵێ؛ گژنیژ 🇮🇷 گشنیز

**بەناجاڕ / benacař/**: ناو. جاڕی بەنا؛ شوێنێ کە بەنای زۆری لێ دەڕوێ 🇮🇷 مرتع سرشار از گیاه «بنا»

**بەناڕۆمی / benařomî/**: ناو. تاوڵێ؛ تاوڵە؛ گژنیژ 🇮🇷 گشنیز

**بەناز / benaz/**: ئاوەڵناو. نازدار ‹لاوی دڵبەند و بەدڵ دڵتەڕ و ساز/ کیژی پشتێن‌شل و چاوباز و بەناز «هەژار، بۆ کوردستان»› 🇮🇷 نازنین

**بەنازونوز / benaz û nûz/**: ئاوەڵناو. کتکاڵ؛ خۆ بەنازکەر 🇮🇷 ملوس

**بەناشوانە / benaş(i)wane/**: ناو. گیایەکە بۆنخۆش، وشکی دەکەن و ڕەگەڵ ماستی دەخەن 🇮🇷 گیاهی است با ماست می‌خورند

**بەناشەمە / benaşeme/**: ناو. ملوانکەی پیاوانە 🇮🇷 گردنبند مردانه

**بەناف / benaf/**: ناو. داری بناو 🇮🇷 درخت زبان گنجشک

**بەناڤ / benav/**: ئاوەڵناو. ١. نێوپڕ؛ پتەو ٢. خاوەن ناو؛ بەناوبانگ 🇮🇷 ١. چگال؛ محکم ٢. مشهور

**ـ بەنان / benan-/**: پاشگر. ــ بەنـدان؛ ڕەوت و هەڕەتی بەستن ‹ڕێبەنان؛ یەخبەنان› ☰ بندان

**بەناو**[1] **/ benaw/**: ئاوەڵنـاو. ١. ☜ بـەناوبانگ ٢. بەدناو؛ ناوزڕاو ☰ ١. ☜ بەناوبانگ ٢. بدنام

**بەناو**[2]: ئاوەڵکار. بەڕواڵەت؛ بەنما ‹یاخوا هەر وا بـێ ئـەی بـەناو ئینسـان!/ نەتانپەرژێتـە سـەر ئێمـەمانان «پیرەمێرد»› ☰ ظاهراً

**بەناوبانگ / benawbang/**: ئاوەڵـناو. بـەنێوبانگ؛ ناسراو؛ بەناو؛ بەناویە؛ ناو داخستوو ‹هەژار شاعیر و نووسەرێکی بەناوبانگە› ☰ مشهور

**بەناوشە / benawşe/**: ☜ بەنەوشە

**بەناوودەنگ / benaw û deng/**: ئاوەڵناو. بـەناوبانگ ☰ مشهور

**بەناوەختی / benawextî/**: ئاوەڵکار. بێگاڤی؛ بێگاڤ ☰ نابهنگام

**بەناویە / benaw(i)ye/**: ☜ بەناوبانگ

**بەنایی / benayî/**: ناو. ١. کـاری خـانوو دروسـت کردن ٢. پیشە و کاری بەنا ☰ ١. کار ساختمانی ٢. شغل بنایی

**بەنباز / benbaz/**: ناو. تەنافباز؛ تەناباز ☰ بندباز

**بەنبازی / benbazî/**: ناو. تەنافبازی ☰ بندبازی

**بەنبڕ / benbiř/**: ناو. تیخ؛ تیغ ☰ تیغ

**بەنپرچ / benpirç/**: ناو. ئەو بەنانەی کیژان پرچی پێ دەبەستن ☰ نخ گیسو بستن

**بەنتەرکی / benterkî/**: ناو. تەرەکیوەن؛ بەنێ کـە بە تەرکی زینەوەیە و شتی پێدەبەسـتن ☰ بنـد فتراک

**بەنجگەر / benc(i)ger/**: ☜ بەنەن جگەر

**بەنـد**[1] **/ bend/**: نـاو. ١. بەندیخانــە؛ گرتووخانــە؛ زیندان ‹تۆ ئازاد پەی سـەیر جـای جاویـدانی/ مـن پابەستەی بەنـد ئـی دنیـای فـانی «مەولـەوی»› ٢. جومگـە؛ گـە ‹هـەموو بەنـدی لەشـم دێشـێ!› ٣. جومگەی قامکانی دەست ٤. پێوەنـدی زینـدانی ‹بەندیان لە پای کردەوە› ٥. حیلە و گزی ٦. جۆی گەورە و هەڵبەستراو ٧. بەنداو؛ بـەرگیرەی لافـاو ٨. گـیر و گرفـت ٩. پارچەیـەک لـە شـیعر ١٠. کورتەگۆرانی ‹بیرەوەری دووی ڕێبەندان/ دەمخاتـە سـەر بەسـتە و بەنـدان «سـوارە»› ١١. نێـوان دوو گرێی ساقەتەی بڕێ ڕوەک ١٢. قەدەغـە؛ قاخـە ١٣. بڵندایی لە تەختاییدا ‹ڕۆژێ ڕێم کەوتـە سـەر بەنـدی شـاخێ/ کێـوێکی دارسـان، بـەرزەدەماخێ «قـانع»› ١٤. پێنجـەم حەوتـەی زسـتان ١٥. وەخت؛ جەنگە ١٦. ساڵی جووت کردنی گا ‹ئەم گایە دوو بەندە، ئەویان سێ بەنـدە› ١٧. بەستەیەک ٥٠٠ لاپەڕە لە کاغەزی ٦٠ لە٩٠ یان ٧٠ لە١٠٠ سـانتیمیتر ١٨. *[ڕێزمان]* ئاوەڵـکار ١٩. مـەودای نێوان دوو ڕزنـە ئـاجور، بـەرد و... ٢٠. ئاوبەنـد؛ بەربەنـد؛ بەنـداو؛ سـەد ☰ ١. زنـدان ٢. مفصـل ٣. مفصل انگشتان ۴. کُندەی پای زنـدانی ۵. نیرنـگ ۶ جوی بزرگ ٧. آبگیر ٨. گرفتاری ٩. قسـمتی از یـک شعر ١٠. ترانـەی کوتـاه ١١. فاصـلە دو گـره برخـی گیاهـان ١٢. قـدغن ١٣. بلنـدی در یـک دشـت ١۴. پنجمین هفتـەی زمسـتان ١٥. هنگـام؛ عنفـوان ١۶. تعداد سالهایی کە گاو شخم زدە است ١٧. بنـد کاغـذ ١٨. قید ١٩. فاصلەی دو رج ٢٠. سد

▣ **بەندی دڵ**: *[مەجاز]* بەندڵ؛ بەنەن دڵ ☰ دلبند

**بەندی جگەر**: *[مـەجاز]* بەنجگەر؛ بەنـەن جـەرگ؛ بنەجەرگ ☰ جگرگوشە

**بەندی مارکرنێ**: پەیمانی ژن مارە بـڕین ☰ عقـد نکاح

**بەندی ناوک**: ڕەگونەهری؛ لوولەی بژیو گـەیێنی زارۆ پێش لە دایک بوون ☰ بند ناف

▣ **بەنـد کردن**: گیر دان؛ ڕاگیر کردن ‹بـە چـرێش بەندم کرد› ☰ نگهداشتن

**بەنـد**[2]: ئاوەڵناو. گیر: ١. بێدەرەتان ‹دە ساڵان بەند بوو› ٢. ماوەوە ‹دلم بە تۆوە بەندە› ☰ ١. محبـوس

٢. وابسته

▣ **بەند بون**: ١. مانەوە؛ نەڕۆیشتن ٢. چەسپین؛ نووسان ☰ ١. ماندگار شدن ٢. چسبیدن

**• بەند[٢]**: پاشەوشە. ١. ـ بەستە؛ بەستراو ‹ئەو پلەبەندی خاک کۆنەهەواران/ من دڵبەندی خاک مەزاری یاران «پیرەمێرد»› ٢. لەبار بۆ بەستن ‹گەردنبەند› ٣. ـ بێن؛ ـ وێن؛ هۆ یا ئامرازی بەستن ‹قۆڵبەند؛ بازووبەند› ☰ ١. بسته شده ٢و٣. ـ بند

**ـ بەندان / bendan/**: پاشوشە. ١. ڕێوڕەسمی بەستن و تێهەڵسوون ‹خەنەبەندان› ٢. ڕەوتی بەستران ‹سەهۆڵبەندان› ☰ ١و٢. ـ بندان

**بەنداو / bendaw/**: ناو. ئاوبەند؛ بەند؛ بەربەند؛ بەربەست؛ کەرپە؛ بەرەگە؛ لەمپەرێ کە وە بەر ئاوی خوڕ (بەتایبەت چەم) دەخرێ تا لای بدا یان بەشێکی لێ گل بداتەوە ☰ آبگیر

**بەندایەتی / bendayetî/**: ناو. کۆیلەتی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی کۆیلە بوون ٢. کار و ڕەوتی پەرستن ☰ ١. بندگی ٢. پرستش

**بەندبڕ / bendbiř/**: ناو. تێغ؛ چەقۆ ☰ تیغه

**بەندبێژ / bendbêj/**: ناو. ستران‌بێژ ☰ آوازخوان

**بەندرو / bendirû/**: ناو. بەندروومان؛ گشتەکە بەن بۆ جواڵدروون ☰ نخ جوالدوزی

**بەندرومان / bendirûman/**: ☜ **بەندرو**

**بەندک / bendik/**: ناو. ١. تا؛ هەودا ٢. ڕێسراوی لە خوری ٣. ملوانکە؛ گەردانە ٤. بنی گیا ٥. مەندۆک؛ مەندێ؛ گیایەکە دە شیرێژ و لۆرکی دەکەن ٦. پێچی شۆڕەوە بوو؛ کراوات؛ بۆینباخ ☰ ١. تار؛ رشته ٢. ریسیدەی از پشم ٣. گردنبند ۴. پیاز گیاه ۵. گیاهی خوردنی ۶. کراوات

▣ **بەندکی دو هەمبانی**: *(مەجاز)* بەندی دوو هەمانە؛ مرۆڤی بە کار نەهاتوو ☰ بی‌کفایت

**بەندکراو / bendk(i)raw/**: ☜ **بەستراو-١**

**بەندکەشی / bendkeşî/**: ☜ **بەنکێشی**

**بەندکەڵەمە / bendkełeme/**: ناو. بەربێن؛ بەن‌کەڵەوە ☰ دهانبند گاو

**بەندوباو / bend û baw/**: ناو. ١. بەنگوباو؛ شایعە؛ دەنگۆ ٢. پەرێز؛ دۆزەنە؛ مرێس ‹بەیتەکان عەیبی مەکەن خوار و کەچن/ مەقسەدم لەم بەندوباوە دەربچن «حاجی قادر»› ٣. ستران و لاوک ‹کوا پەریخان بەندوباوم بۆ بڵێ؟/ بۆ نەسووتێم، نەبمە پۆلووی سەر کڵێ؟ «هێمن»› ☰ ١. شایعه ٢. چهارچوب ٣. شعر و آواز

**بەندوبەست / bend û best/**: ناو. کاکەوبرالە؛ خلێنەوبلێنە؛ ڕاوێژی دوو یان چەند کەس زیاتر بۆ کارێکی ناڕەوا یان بەدەست هێنانی دەسکەوتێکی نابەجێ ‹وا دیارە لە ژێرەوە بەندوبەستێکیان هەبێ!› ☰ بندوبست

**بەندوبەستەڵەک / bend û bestełek/**: ناو. شەختە و سەرمای تووش ☰ سرما و یخبندان سخت

**بەندۆخین / bendoxîn/**: ☜ **دۆخین**

**بەندۆک / bendok/**: ناو. بەندۆکە؛ بەنگۆکە: ١. گیایەکی کوێستانییە ٢. بەنی ژێرچەنە کە کڵاوی پێ ڕادەگرن ☰ ١. گیاهی کوهستانی ٢. بند کُلاه

**بەندۆکە / bendoke/**: ☜ **بەندۆک**

**بەندۆڵ / bendoł/**: ناو. زەنبەلەک؛ فەنەری سەعات ☰ فنر ساعت

**بەندە[١] / bende/**: ناو. بەنە؛ بەنی؛ وەنە: ١. کۆیلە ٢. نۆکەر ☰ ١. برده ٢. نوکر

**بەندە[٢]**: جێناو. بەنەە؛ من؛ ئەز (لە ڕێز گرتندا) ‹بەندە یەی نەفەر کرانشینم/ چو عەزیز مردی دایم غەمینم «شامی»› ☰ بنده؛ من

**بەندە ـ بەندە / bende bende/**: ناو. بەند بە بەند؛ کۆی بەندەکانی کۆمەڵەیەک ‹لە ڕووی ئاسمان بە گڕی سوور نووسراوە/ بەندە ـ بەندەی ئایین‌نامەی بڕواکەم «گۆران»› ☰ بند ـ بند

**بەندەخوێن / bendexwên/**: ☜ **دۆخین**

**بەندەر / bender/**: ناو. بەنەر: ١. ئەسکەلە؛ لەنگەرگا؛ شوێنی پاڵ گرتنی گەمیە ٢. سترینگەهـ؛ شاری سەر دەریا ٣. بریکار؛ وەکیل ☰ ١. بندر ٢. شهر بندری ٣. وکیل

**بەندەرگا / benderga/**: ناو. بەندەرگە؛ دامەزراوەیەک لە ڕەخی ئاودا بۆ بار کردن یان بار داگرتن لە گەمیە ☰ بندرگاه

**بەندەرگە / benderge/**: ☜ **بەندەرگا**

**بەندەری / benderî/**: ئاوەڵناو. سەر بە بەندەر ☰ بندری

**بەندەڤان / bendevan/**: ☜ **بەندیوان**

**بەندەقە / bendeqe/**: ناو. تەوەرە؛ ئاسنی بن بستی ئاش ☰ قطب آسیاب

**بەندەک / bendek/**: ناو. ١. لنگە بار ٢. بەز و چەورایی سەر لاتەڕاخەی ئاژەڵ ٣. پاوەن؛ پێبەند ‹بەرگی ڕەش ئیتر لە بەرمان دادڕا/ بەندەکی دیلی و ئەسارەت هەڵبڕا «هێمن»› ☰ ١. لنگەی بار ٢. چربی روی دنده و شکم حیوان ٣. بند پا

**بەندەکە / bendeke/**: ناو. باقەبێن؛ باغەبێن؛ باقەوەس ☰ بستەبند گیاه

**بەندەن / benden/**: ناو. بەنەن؛ بەرقەد؛ قۆپی: ١. داوێن و لای خوارووی چیا ‹بەهار بوو دیسان خەملی وەک بەهەشت / مێرگ و لاپاڵ و بەندەن و پێدەشت «هێمن»› ٢. کێوی نە زۆر بڵند ‹بەشاخ و شکێڕانەوە/ بە بەندەن و لێڕانەوە «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ ١. دامن کوه ٢. کوهپایە

**بەندەوار / bendewar/**: ئاوەڵناو. ١. چاوەڕێ ٢. زیندانی ٣. کۆیلەئاسا ☰ ١. منتظر ٢. زندانی ٣. غلامآسا

**بەندەواری / bendewarî/**: ناو. ئەوینداری ☰ عاشقی

**بەندەهوون / bendehûn/**: ☜ **دۆخین**

**بەندەیی / bendeyî/**: ناو. کۆیلەتی؛ کۆلەتی ☰ بردگی

**بەندهاتوو / bendhatû/**: ئاوەڵناو. ڕووگرتی؛ دەڵەمە ☰ دلَمە؛ بستە (شیر)

**بەندی**[1] **/ bendî/**: ناو. زیندانی؛ بەنی ‹چوار بەندی بەردران› ☰ زندانی

**بەندی**[2]: ئاوەڵناو. گراو؛ گیراو؛ زیندانی؛ بەنی ‹ئارامیش ساڵێک بەندی بوو› ☰ زندانی

**- بەندی**[3]: پاشەوشە. - بەنی: ١. چنین ‹ڕیزبەندی› ٢. بڕینەوە ‹جیرەبەندی› ☰ ١و٢. - بندی

**بەندیخانە / bendîxane/**: ناو. زیندان؛ زینان؛ گرتووخانە ‹ئاخرین ماڵی ژیانم کونجی بەندیخانەیە/ ئەم کەلەپچە مەرهەمی زامی دڵی دیوانەیە «قانع»› ☰ زندان

**بەندیر / bendîr/**: ☜ **بەردیل -٢**

**بەندیرە / bendîre/**: ☜ **بەندێر**

**بەندیل / bendîl/**: ناو. ١. پیاسکە؛ بوخچەی چکۆلە ٢. ☜ **بەردیل -٢** ☰ ١. بُقچەی کوچک ٢. ☜ **بەردیل -٢**

**بەندیوار / bendîwar/**: ئاوەڵناو. پێوەندیدار؛ گرێدای؛ گرێدراو ‹گەرمیانی بە دانیشتوو یان هەر شتێکی بەندیوار بە گەرمیانەوە دەگوترێ› ☰ وابستە

**بەندیوان / bendîwan/**: ناو. بەندەڤان؛ زیندانوان ☰ زندانبان

**بەندیەتی / bendyetî/**: ناو. دیلی؛ گیراوی؛ ژێرچەپۆکی ☰ اسارت

**بەندێخوون / bendêxûn/**: ☜ **دۆخین**

**بەندێر / bendêr/**: ناو. بەندیرە؛ ئاڵا؛ بەیداخ ☰ پرچم

**بەنرخ / benirx/**: ئاوەڵناو. بەبایەخ؛ بایەخدار؛ هێژا؛ ‹شاعیرێک بوو بەنرخ و بێوێنە/ بیری ڕۆشن بوو چەشنی ئاوێنە «هێمن»› ☰ ارزندە

**بەنرخی / benirxî/**: ناو. هێژایی ☰ ارزندگی

**بێوەری** / bêwerî/: ئاوەڵناو. بێبەش؛ بێنسیب؛ پێ نەگەیشتوو ☰ بی‌نصیب

**بێوەژن** / bêwejin/: ناو. شوو مردوو ☰ بیوه‌زن

**بێوەژنکۆشی** / bêwejinkoşî/: ناو. [کینایە] دۆخی ڕەنج و دەردی هەژاری کێشان بۆ نان ☰ تحمل رنج و فقر بسیار

**بێوەسیری** / bêwesîrî/: ☜ بەواسیر

**بێوەشارتن** / bêweşartin/: ئاوەڵناو. ڕەپ؛ ڕاست؛ بێ‌گرێ و ڕەوان ☰ رُک و صریح

**بێوەفا** / bêwefa/: ئاوەڵناو. بەدنمەک؛ ڕافزی ☰ بدقول

**بێوەڵە** / bêwełe/: ناو. بێوڵە؛ بەچکەساوای ورچ ☰ بچه خرس

**بێوەڵەورچ** / bêwełewirç/: ناو. حەشکۆڵە؛ بەچکەورچ ☰ بچه‌خرس

**بێوەمێرد** / bêwemêrd/: ناو. بێوەپیاو ☰ مرد بیوه

**بێوەی** / bêwey/: ئاوەڵناو. بێ‌زیان؛ سەلامەت ‹ڕۆڵە ئازاکان! یاخوا بێوەی بن!› ☰ بی‌آزار؛ سالم

**بێوێنە** / bêwêne/: ئاوەڵناو. بێ‌هاوتا؛ بێ‌هەوال ‹شاعیرێک بوو بەنرخ و بێوێنە/ بیری ڕۆشن بوو، چەشنی ئاوێنە «هێمن»› ☰ بی‌نظیر

**بێهاز** / bêhaz/: ئاوەڵناو. ١. بێ‌تابشت لەبەر هیلاکی و برسییەتی ٢. بێ‌هێز؛ بێ‌گیان ☰ ١. ضعیف ٢. ناتوان

**بێهاوتا** / bêhawta/: ئاوەڵناو. بێ‌وێنە ☰ بی‌نظیر

**بێهاودەمی** / bêhawdemî/: ☜ بێکەسی

**بێهاوڕێ** / bêhawřê/: ئاوەڵناو. سەڵت؛ تەنیا ☰ تنها؛ بی‌همدم

**بێهاوسەر** / bêhawser/: ئاوەڵناو. ڕەبەن؛ زگورد ☰ مُجرد

**بێهجین** / bêhcîn/: ☜ بهجین

**بێهمان** / bêhman/: پێرۆ. ← فلان‌وبێهمان

**بێهن** / bêhin/: ناو. بۆ؛ بۆن ☰ بو

**بێهنتەنگ** / bêhinteng/: ئاوەڵناو. [کینایە] پرزەکوت؛ بێ‌تاقەت ☰ ناشکیبا

**بێهندرێژ** / behind(i)rêj/: ئاوەڵناو. بەبەز ☰ پرنفس

**بێهنژاندن** / bêhnijandin/: چاوگ. پژماندن ☰ بە عطسە انداختن

**بێهنژین** / bêhnijîn/: چاوگ. پژمین ☰ عطسە کردن

**بێهۆ** / bêho/: ئاوەڵناو. بێخود؛ خۆڕایی ☰ بی‌دلیل

**بێهۆش** / bêhoş/: ئاوەڵناو. ١. دڵ‌بووراو؛ لەسەر خۆ چووگ ٢. گێژ و نازیرەک ‹تێ‌نەگەیشتبوو دلداری بێهۆش!/ کە کچ زوو کوڕان دەکەن فەرامۆش «هێمن»› ✻ هەروەها: **بێهۆشی** ☰ ١. بیهوش ٢. گیج؛ منگ

⊡ **بێهۆش بوون**: بوورانەوە؛ لە هۆش چوون. هەروەها: **بێهۆش کردن** ☰ از هوش رفتن

**بێهۆشدارو** / bêhoşdarû/: ناو. دەرمانی بێهۆشی ☰ داروی بیهوشی

**بێهوودە**[١] / bêhûde/: ئاوەڵناو. خۆڕایی؛ بێخۆ ‹عومری بێهوودە› ☰ بیهوده

**بێهوودە**[٢]: ئاوەڵکار. بێ‌ئەنجام؛ بێ‌ئاکام ‹سەد کەرەت کوژراوی یار بم لێم مەپرسە ئەی تەبیب!/ دەردی یارم خۆشترە، بێهوودە دەرمانم مەکە! «وەفایی»› ☰ الکی؛ بیهوده

**بێهەست** / bêhest/: ئاوەڵناو. ١. سڕ؛ سوڕ ٢. بێ هەستۆکی ☰ ١. بی‌حس ٢. بی‌احساس

**بێهەستی** / behestî/: ناو. ١. سڕی ٢. چۆنیەتی نەبوونی هەستیاری ☰ ١. کرختی ٢. بی‌احساسی

**بێهەناو** / bêhenaw/: ئاوەڵناو. [مەجاز] ترسەنۆک؛ بێ‌زراو ☰ بُزدل

**بێهێز** / bêhêz/: ئاوەڵناو. بێ‌وزە؛ بێ‌تووش؛ بێ‌تابشت ☰ ناتوان

**بێیاوان** / bêyawan/: ☜ بیابان[١]

**بێ‌یەک‌و‌دوو** / bê yek û dû/: ☜ بێ‌سێ و دوو

# پ

**پ¹** /p/: پیت. نیشانەی پیتی چوارەمی ئەلفوبێی زمانی کوردی ≡ پ؛ نشانەی چهارمین حرف الفبای زبان کُردی

**پ ـ²**: پێشگر. دروستکەری بەشی دووهەمی وشەدوانەی مانا لێڵ ‹پاخان: چاخان‌پاخان؛ پاتەران: هاتەران پاتەران› ≡ سازندەی کلمەی مهمل

**پ** /pi/: ناو. ناوی پیتی چوارەمی ئەلفوبێی زمانی کوردی ≡ پ؛ چهارمین حرف الفبای زبان کُردی

**پا¹** /pa/: ناو. پێ: ١. لاق؛ قاچ ‹وەختێو پا مەنیان وە بالای کەمەر/ نە خاکی پاشان گولان مەنیان سەر «سەیدی»› ٢. هەنگاو ‹چو کاوڕ وە گورگ وە لی ڕەم کردم/ یەی پا هاتە وەر سێ پا دوور گردم «شامی»› ٣. داوێن؛ پاڵداوین ‹هانە پای ئەو کۆ ڕەندان، چوون پەری/ گشت ئامادەی حوسن شۆخی و دولبەری «سەیدی»› ٤. قەراخ؛ ڕەخ ‹چوومە پای ئاوەکە› ٥. پلە؛ پایە ‹کەس ناگاتە پای تۆ› ٦. ڕەوت؛ شێوە؛ پێ‌وڕێ ‹بەم پا بڕوا، گران دەبێ› ٧. ماشە؛ پەلەپیتکە ٨. ڕکێف؛ ڕکێو؛ زەنگوو ٩. *[کینایە]* وزە؛ هێز ‹پای شەرم نەماوە› ١٠. *[کینایە]* کۆڵەکە؛ پاڵپشت ‹کورەکانم پای منن› ١١. ئەندازە ‹با ئەوی تریش هەر بەم پایە بێ› ١٢. فووت؛ یەکەیەکی درێژایی بەرانبەر بە ٣٠،٤٨ سانتی‌میتر ١٣. ودم؛ ورم؛ فەڕ و پیت ≡ ١. پا ٢. گام ٣. دامنه ۴. کناره ۵. پایه؛ درجه ۶. روال؛ منوال ۷. ماشه ۸. رکاب ۹. نا؛ توان ۱۰. پشتوانه ۱۱. اندازه. ۱۲. فوت ۱۳. شگون

▣ **پا وە پا(ی کەسێک)**: شان بە شان(ی کەسێک) ‹نە هەر دوو تەرەف دوو سەف دان قەتار/ پا وە پای ئێمە هەر سوب تا ئێوار «ئاغا عینایەت»› ≡ پا به پا(ی کسی)

▣ **پا بیەی**: *[مەجاز]* بە پێ و قەدەم بوون؛ بە ودم بوون ≡ آمد داشتن

**پا پیاساوین**: *[کینایە]* ١. پێخوست کردن ٢. چاو لێ پۆشین ٣. سەرپۆش لە سەر دانان ≡ ١. پایمال کردن ٢. چشم‌پوشی کردن ٣. سرپوش گذاشتن

**پا پیا نان**: پێ لێ نان؛ پێ لە سەر نان ≡ لگدمال کردن

**پا لێ تەقاندن/ تەقانن**: *[مەجاز]* زۆر بۆ هێنان ≡ تحت فشار قرار دادن

**پا پێوە دان**: پێ خستنە جوولە بۆ لێخوڕین (ئەسپ و دووچەرخە و ...) ≡ رکاب زدن

**پا خستن**: *[کینایە]* ١. لە پێ کەوتن؛ زۆر ماندوو بوون لە ڕێگەدا ٢. *[کینایە]* زۆر نەخۆش و کەلەلا کەوتن ≡ ١. از پا افتادن ٢. به شدت بیمار شدن

**پا خواردن**: *[کینایە]* ١. وەبەر پا کەوتن ‹ئەو

فەرشە هەرچی پا بخوا، جوانتر دەبێ› ٢. [کنایە] تەمەن تێپەڕ کردن ‹ماشەڵڵا، مامە زۆراب هەرچی پا ئەخوا، بەگوڕتر ئەبێتەوە!› ≡ ١. زیر پا بودن ٢. عُمر کردن

**پا داکێشان:** [کنایە] ١. سانەوە؛ لاق ڕاکێشان بە مەبەستی حەسانەوە ‹دوای ئەو هەموو کار و ماندوو بوونە، کاتی ئەوەیە هێندێک پا داکێشم› ٢. [کنایە] لە ڕادەی خۆ دەرچوون ‹من دەنگ ناکەم، ئەو هەر زیاتر پا دائەکێشێ!› ٣. گایین؛ قایل بە گایین کردن ≡ ١. پا سبک کردن ٢. از حدود خود تجاوز کردن ٣. گاییدن

**پا داگرتن:** [کنایە] پێ داگرتن؛ پا دانە گەز؛ پا گەزدان؛ سوور بوون لە سەر کارێ ‹مامم پای داگرتووە، منیش لەگەڵی بڕۆم› ≡ پافشاری کردن

**پا دان:** ١. پێ لێدان؛ تێهەڵدان ٢. [کنایە] ڕازی بوون؛ ڕێدان ٣. [کنایە] هەڵسووڕان؛ دەست دان؛ ڕێک کەوتن ‹پا بدا سەفەرێکی ئەودیو دەکەم› ≡ ١. تیپا زدن ٢. راضی شدن ٣. فراهم شدن

**پا دانە گەز:** ☜ **پا داگرتن**

**پا سەر نیان:** [کنایە] سەر دە دوو نان؛ شوێن کەوتن ≡ تعقیب کردن

**پا کرانەوە/ کریانەوە:** [کنایە] ١. بۆ یەکەم جار (بەتایبەت بووک و زاوا) بۆ شوێنێ پێکەوە بانگهێشت کران ٢. فێرە شوێنێ بوون و زۆر بۆ ئەو شوێنە چوون ‹پای کراوەتەوە و هەموو ڕۆژێ دەچێ بۆ ماڵیان› ≡ ١. پاگُشا شدن ٢. پای کسی به جایی باز شدن

**پا کردنەوە/ کرنەوە:** [کنایە] بانگێشت کردن (بەتایبەت بووک و زاوا) بۆ شوێنێ کە پێشتر پێکەوە نەچوون ≡ پاگُشا کردن

**پا گرتن:** [کنایە] پێ گرتن؛ فێرە ڕۆیشتن بوونی منداڵ ≡ سر پا افتادن بچە

**پا گەرمەو بوون:** [کنایە] تاوێ لە شوێنێ جێگیر بوون ‹پەلە مەکە! با پات گەرمەوە بێ جا داوای نان بکە› ≡ اندکی در جایی ماندن

**پا گەزدان:** ☜ **پا داگرتن**

**پا لە پەین دان:** [کنایە] ١. بەتاڵ و حەتاڵ گەڕان ٢. بێ‌هۆ چاوەڕوان بوون ≡ ١. ول گشتن ٢. ولِ‌مُعطل بودن

**پا لێ تەقاندن:** [مەجاز] زۆر بۆ هێنان ≡ تحت فشار قرار دادن

**پا نان/ نیان:** ١. چوونە ناو ‹هەر پام نایە ناو ماڵەکە، بوو بە هەرا!› ٢. [کنایە] گەیشتن ‹پای ناوەتە نێو پەنجا› ≡ ١. وارد شدن ٢. رسیدن

**پا نانە/ نیانە پێشەوە:** [کنایە] داوخواز بوون؛ بە ویستی خۆ، ئامادەی جێبەجێ کردنی کارێک بوون ≡ داوطلبانە پا پیش گذاشتن

**پا نانە/ نیانە ڕێس مل:** [کنایە] خستنە تەنگانەوە ≡ در تنگنا قرار دادن

**پا نانە/ نیانە پێش:** پێ لە سەر دانان ‹تکەش عاجز کەرد خەیاڵت تێشدا/ ئازیز بۆ جارێک پا بنیەر پێشدا «مەولەوی»› ≡ پا بر (چیزی) نهادن

**پا هەڵخستن:** [مەجاز] خێرا چوون و گەڕانەوە ≡ سریع رفتن و برگشتن

**پا هەڵکەفتن:** هەڵەنگووتن؛ ڕەت بردن ≡ سکندری خوردن

**پا هەڵگرتن:** [مەجاز] خۆشتر ڕۆیشتن؛ توند کردنەوە ≡ سریع‌تر رفتن

**پای زیادی داکێشان:** [کنایە] زێدەڕۆیی کردن؛ زیاتر لە ڕادەی خۆ، دەست بۆ شتێ بردن ≡ پا از گلیم خود دراز کردن

**پا لە کەسێک/ شوێنێک بڕان/ بڕیان:** [کنایە] نەمانی پێوەندی و هاتوچۆی کەسێک بۆ لای کەسێ/ شوێنێ ‹شەیدای خاکەسار، هەی خەمخەیاڵ وێم/ پا جە دۆست بڕیان، هەی

ویران‌ماڵ ویّم «بێسارانی»〉 قطع شدن ارتباط کسی با جایی

**دوو پا کردنە کەوشێکا:** *[کینایە]* هیچ قسەیەکی تر نەبیستن 〈دوو پای کردگەسە کەوشێکا ئەیژێ ئەچم!〉 هیچ انعطاف نداشتن

**پا**[۲]: ئاوەڵناو. ١. *[سوورکەڵە]* پاک؛ خاوێن 〈شۆردم، پا بۆوە〉 ٢. خواری ئامانج ١. پاک ٢. پایین هدف

⊡ **پا بوونەوە** ☜ **پاك بوونەوە**

**پا کردن:** *[کینایە]* بەر کردن؛ کورت هێنانی تیر یان بەرد لە ئامانج 〈لێم تەقاند، نەیپێکا، پای کرد〉 پایینِ هدف زدن

**پا (پاک) کردن/ کردنەوە** ١. خاوێن کردنەوە؛ تەمیس کردن 〈گەنمەکەم، پا کرد〉 ٢. تێکۆڵ لێ‌کردنەوە 〈ئەو خەیارەم بۆ پا کە!〉 ١. تمیز کردن ٢. پوست کندن

**پا**[۳]: ئامراز. کە وابوو؛ کە وابێ؛ سا 〈پا، ژ مەرا چێ نابت〉 پس

**پا**[۴]: سارستە. پەحا؛ وشەی سەیر مان 〈پا! سەیرە بەخوا!〉 شگفتا

**پا**[۵] **ـ**: پێشوشە. ١. بن؛ خوار 〈پادیوار؛ پاکەش〉 ٢. هاوڕێ و پارێزەر 〈پاوەوی〉 ٣. دوا؛ پاش 〈پاشارۆ〉 ٤. بریکار 〈پاخەسوو〉 ١. پایین ٢. مراقب و همراه ٣. پس ـ پسا ـ ۴. پیشکار

**ـ پا**[۶]: پاشەوشە. هەڵساو؛ بەرقەرار؛ ئامادەی کار 〈بەرپا؛ سەرپا〉 ـ پا

**پائەوشار / pa'ewşar/**: ناو. دەپی ژێر قاچی جۆلا پای‌افشار جولایی

**پابۆس / pabos/**: ناو. کاری پا ماچ کردن 〈گیان وە لەب یاوان پەی پابۆس پات/ بەیۆ یا نەیۆ تۆ چێشەن سەلات «مەولەوی»〉 پابوس

**پابەرە / pabere/**: ناو. دەرپێ؛ ژێرشواڵ پیژامە

**پابەرێ / paberê/**: ناو. دەرپێ (زۆرتر ئی ژنان) شلوار (بیشتر زنانە)

**پابەستە / pabeste/**: ئاوەڵناو. گیراو؛ یەخسیر؛ ئازادی لێ گیراو 〈تۆ ئازاد پەی سەیر جای جاودانی/ من پابەستەی بەند ئەی دنیای فانی «مەولەوی»〉 اسیر

**پابەمانگ / pabemang/**: ☜ **پاوەمانگ**

**پابەند**[۱] **/ pabend/**: ناو. ١. پێوەند؛ پاوەن؛ پاوانە؛ پاشوەن؛ بەندی ئاسنی قاچی یەکسم ٢. بەرعۆدە؛ دەستەبەر؛ کەسێ کە لە لایەن کەسێکی ترەوە بڕیاری کارێک بدا ١. بخو؛ پابند ستور ٢. ضامن

**پابەند**[۲]: ئاوەڵناو. پێ‌بەند: ١. گیرۆدە؛ گرفتار 〈نەک چوون من پابەند قەڵای شار دەرد/ نەی وەهار چوون وەڵگ پاییزان ڕەنگ‌زەرد «مەولەوی»〉 ٢. دڵ‌بەستوو؛ خووپێ‌گرتوو 〈وەها پابەندی بسکی شێتوپێتم، بێ‌خەبەر ماوم/ لە خۆم و حاڵ‌وباڵم، حاڵی من دیوانە دەیزانێ «ئاوات»〉 ٣. دەربەست؛ بڕوامند 〈پابەند بە هیچ بیر و بڕوایەک نییە〉 ١. گرفتار ٢. مأنوس ٣. پایبند؛ مقید

**پابەوەخت / pabewext/**: ئاوەڵناو. کیژەعازەوی گەیشتووە کاتی شوو کردن دمِ بخت

**پابێڵ / pabêł/**: ناو. ١. بڕشتی یەک پێمەڕە ٢. کاری شێوەرد کردنی زەوی بە بێڵ (بە هێزی پێ) ١. برش حاصل از یک بار بیل زدن ٢. بیلکاری

⊡ **پابێڵ کردن:** کەندن و شێف بڕینی زەوی بە بێڵ بیل زدن زمین

**پاپ / pap/**: ناو. ١. پاپا؛ هەرەمەزنی خاچ‌پەرستان ٢. خڵت؛ تڵتە؛ خەوش و ماکی بنی تراو ٣. کرێژی پێست ١. پاپ؛ رهبر کاتولیک‌های جهان ٢. دُرد؛ دُردی ٣. شورەی سر و بدن

**پاپا**[۱] **/ papa/**: ناو. ١. باپیر؛ باوا؛ باوەگەورە ٢. پاپ؛ هەرەمەزنی خاچ‌پەرستان ٣. *[منداڵانە]* پێ؛ پا ٤. *[منداڵانە]* پێڵاو؛ کەوش ٥. پاوپایی؛ بێ‌تاقەتی؛ دۆخی بێ ئۆقرە و ئارام بوون ١. پدربزرگ ٢. پاپ ٣. پا ۴. کفش ۵. بی‌تابی

⊡ **پاپا کردن** ۱. ڕێ چوونی منداڵ ۲. *[منداڵانە]* هەستان؛ هەڵسان؛ هەڵستان 🇮🇷 ۱. تاتی ـ تاتی راه رفتن بچه ۲. ایستادن؛ پا شدن

**پاپا**[۲]: ئاوەڵناو. ۱. پاپەی؛ زۆر داواکار ۲. بێتاقەت؛ ئۆقرە و ئارام لێ بڕاو 🇮🇷 ۱. خواهان ۲. بی‌تاب

⊡ **پاپا بون** چاوەڕوان و بێتاقەت بوون ‹کێ لەو دەمەدا بیا تخوونی/ پاپای بوو لە مردن و نەبوونی «هەژار، *مەم و زین*»› 🇮🇷 بی‌تاب بودن

**پاپاجانە** / papacane/: ناو. پاپووچکە؛ پاپووچە؛ پاپەجانە؛ پاپەجانێ؛ کەوشی منداڵان 🇮🇷 پاپوش بچه

**پاپاچینە** / papaçîne/: ناو. ۱. پێی‌پێلکەی کاریزکەن کە لە دیواری دەکۆڵێ ۲. ☜ **پەیژە** 🇮🇷 ۱. پلّکان قنات ۲. ☜ **پەیژە**

**پاپاخ** / papax/: ناو. پاپاغ؛ کڵاوی عەجەمی 🇮🇷 پاپاخ

**پاپارنجی** / paparincî/: ☜ **پاپارنجێ**

**پاپارنجێ** / paparincê/: ناو. پاپارنجی؛ یارییەکی منداڵانە، پشت بە پشتی یەکترەوە دەنێن و هەرکام بە نۆرە کۆم دەبنەوە و ئەوی‌تر بە پشتەوە، دەکەوێتە سەر پشتی و ئەم بەیتە دەڵێنەوە: (پاپارنجێ، کۆترە قرینجێ/ کۆترە قرینجێ، پاپارنجێ) 🇮🇷 از بازی‌های کودکانه

**پاپاغ** / papağ/: ☜ **پاپاخ**

**پاپرتوک** / papirtûk/: ناو. پەپوولە؛ پەروانە 🇮🇷 پروانه

**پاپریک** / pap(i)rîk/: ناو. جۆرێ پەپوولە 🇮🇷 نوعی پروانه

**پاپل** / papil/: ناو. پل؛ چرۆ؛ چووزە؛ وردە لکی دار 🇮🇷 جوانه‌ی درخت

**پاپلەکانێ** / pap(i)lekanê/: ناو. پاپلێکانێ؛ جۆرێک جۆلانەی گوریس 🇮🇷 نوعی تاب‌بازی

**پاپلێکانێ** / pap(i)lêkanê/: ☜ **پاپلەکانێ**

**پاپۆڕ** / papoř/: ناو. گەمیە؛ کەشتی ‹تووشی لافاوی عیلم بووم و بەلام زوو دەرپەڕیم/ سواری پاپۆڕی جەهل بووم و بە ناویا تێپەڕیم «بێکەس»› 🇮🇷 کشتی

**پاپۆڕوان** / papořwan/: ☜ **پاپۆڕەوان**

**پاپۆڕەوان** / papořewan/: ناو. پاپۆڕوان؛ گەمیوان؛ گەمیەوان 🇮🇷 کشتیبان

**پاپۆش** / papoş/: ناو. ۱. شواڵ، بەتایبەت شواڵی ژنانە ۲. دەرپێ؛ هەر شتێ کە لای خوارووی لەش دادەپۆشێ ۳. *[کینایە]* پێلان. هەروەها: **پاپۆش دروست کردن** 🇮🇷 ۱. شلوار زنانە ۲. پیژامە؛ پوشش پایین‌تنه ۳. پاپوش

**پاپۆکە** / papoke/: ناو. پەپکە (بەتایبەت بۆ مار دەگوترێ، کاتێ خۆی کۆ دەکاتەوە). هەروەها: **پاپۆکە دان** 🇮🇷 چنبره

**پاپوچکە** / papûçke/: ☜ **پاپاجانە**

**پاپوچە** / papûçe/: ☜ **پاپاجانە**

**پاپوش** / papûş/: ناو. ۱. پێڵاو؛ پاڵا ۲. دەرپێ 🇮🇷 ۱. پای‌افزار ۲. پیژامه

**پاپە** / pape/: ئاوەڵناو. گرنگیدەر 🇮🇷 در قید

⊡ **پاپە بون** گرنگی دان؛ خەمخۆر بوون ‹باوکم بۆ برێ کار هەر پاپە نەبوو› 🇮🇷 اهمیت دادن؛ در قید بودن

**پاپەتی** / papetî/: ئاوەڵناو. پێپەتی: ۱. خواس؛ پێخواس؛ بێ‌پێڵاو ۲. *[کینایە]* نەفام؛ تێنەگەیشتوو ‹لە سەر خاکی کوردەواری/ ڕەش و پاپەتی داباری «هەژار، *بۆ کوردستان*»› 🇮🇷 ۱. پابرهنه ۲. پاپّتی

**پاپەجانە** / papecane/: ☜ **پاپاجانە**

**پاپەجانێ** / papecanê/: ☜ **پاپاجانە**

**پاپەجینە** / papecîne/: ☜ **پەیژە**

**پاپەل** / papel/: ناو. بن‌گەڵا؛ بن‌پەلک 🇮🇷 برگِ پیر

⊡ **پاپەل کردن** قرتاندنی گەڵای پیر و زەردی لای خوارووی نەمام و برکە تووتن 🇮🇷 چیدن برگ‌های پژمُرده و زائد نهال و بوته‌ی توتون

**پاپەنج / papenc/**: ناو. سیخوڕ؛ سیچڕ؛ جۆرێ ژژووی تیرهاوێژ ☰ نوعی خارپُشت

**پاپەنجە / papence/**: ☜ **پەیژە**

**پاپەی / papey/**: ناوەلناو. پاپا؛ زۆر داواکار ☰ بی‌تاب

**پاپەینجە / papeynce/**: ☜ **پەیژە**

**پاپی / papî/**: ناو. ۱. شووفار؛ زوانگیر ۲. بنار؛ دەمەقالە ☰ ۱. جاسوس ۲. بگومگو

**پاپیا / pap(i)ya/**: ☜ **پاپیادە**

**پاپیادە**[1] **/ pap(i)yade/**: ناو. پاپیا؛ پاپیارەتە؛ پیادە ☰ پیادە

**پاپیادە**[2]: ناوەلکار. پاپیا؛ پاپیارەتە؛ پەیامە؛ بە پێیان؛ بە پای پیادە ‹پاپیادە هاتم› ☰ پیادە

**پاپیارەتە / pap(i)yarete/**: ☜ **پاپیادە**

**پاپیسلێمونی / papîs(i)lêmunî/**: ☜ **پەپووسلێمانە**

**پاپیسڵێموونی / papîs(i)łêmûnî/**: ☜ **پەپووسلێمانە**

**پاپیلکە / papîlke/**: ☜ **پەیژە**

**پاپیۆن / papyon/**: ناو. پارچەیەکی لە بیچمی پەپوولە کە بە بەن یان کێش، بە یەخە یان قژیەوە دەبەستن ☰ پاپیون

**پاپێچ / papêç/**: ناو. شەکال؛ شەقال؛ پاتاوە؛ جۆرێک پێڵاوی بە موو چندراو کە ژێرەکەی بە بەنێک دەبەسرێتە لاقەوە ☰ پالیک؛ چارق؛ چارغ

**پاپێژ / papêj/**: ناو. گەمرە؛ دەوەی بە پا پێژاو ☰ سرگین پاخوردە

**پاپێنجە / papênce/**: ☜ **پەیژە**

**پات**[1] **/ pat/**: ناو. ۱. هەویر ۲. گولێکە ☰ ۱. خمیر ۲. گُلی است

**پات**[2]: ناوەلناو. قەتیس؛ بێ‌جوولە مانەوە لە شەترەنجدا ☰ پات (حالتی در شطرنج)

**• پات**[3]: پاشەوشە. ۱. ـ پێژ؛ برێژ ‹نان‌پات› ۲. بارە؛ سەرە ‹دووپات› ۳. ئامال ـ مەیلەو ـ (بۆ ڕەنگ دەگوترێ) ‹سپی‌پات› ☰ ۱. ـ پز؛ پزندە ۲. ـ بارە ۳. ـ فام

**پاتاڵ**[1] **/ patał/**: ناو. ۱. ئاژاڵ؛ ولسات ‹هێندێ پاتاڵی دۆم هەبوو/ لە هەر شت بەشی خۆم هەبوو «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ۲. کۆنەپەڕۆ ☰ ۱. احشام ۲. کهنه پارچە

⊡ **پاتاڵ ڕاگرتن**: ئاژەڵ بە خێو کردن ‹نانی پەیدا کە بە هۆی کشت و کاڵ/ پاتاڵ ڕابگرە با نەڵێن پاتاڵ «حەقیقی»› ☰ دام پروردن

**پاتاڵ**[2]: ناوەلناو. ۱. ڕووتی بێ‌ئەنوا ۲. *[کینایە]* تەمبەڵی بێکارە ۳. *[کینایە]* کەر و نەفام ☰ ۱. برهنەی بینوا ۲. لش و بیکارە ۳. ابلە

**پاتاڵ**[3]: پێرۆ. ← **پیرۆپاتاڵ**

**پاتاوە / patawe/**: ناو. ۱. پالا؛ پێڵاو؛ کالە؛ کالک ۲. پێتاوە؛ پووزپێچ؛ پووزەوانە؛ بەلەکپێچ ☰ ۱. پای‌افزار ۲. پاتابە

**پاترا / patra/**: ناوەلناو. گوم؛ بێ‌سەروشوێن ‹مانگێکە پاترا بووە و هەواڵی نازانم› ☰ گم؛ مفقودالاثر

**پاتشا / patşa/**: ناو. شا؛ پاوشا؛ پالشا ☰ پادشاه

**پاتشایەتی / pat(i)şayetî/**: ناو. شایەتی؛ شایی ☰ پادشاهی

**پاتک / patik/**: ناو. ۱. بۆق‌مل؛ پشتەمل؛ پشتی مل ۲. پشتەسەر؛ پشتی سەر ۳. چەپکێ گەلاتووتن ٤. پارچەپینە ☰ ۱. پس گردن ۲. قفا ۳. دستەای برگ توتون ۴. وصلەی پارچە

**پاتکپان / patikpan/**: ناوەلناو. *[پلار]* مل‌قەوی؛ مل‌ئەستوور ☰ گردن‌کلفت

**پاتلن / patilin/**: ☜ **پاشێل**

**پاتن / patin/**: چاوگ. ۱. برژان؛ برژیان؛ بێژان ۲. سووتان؛ سووتیان؛ شەوتین ☰ ۱. پُختن ۲. سوختن

**پاتۆ / pato/**: ناو. ۱. کۆلووی نان؛ هەویری لە تەندوورا سووتاو ۲. کولێرە؛ کولۆرە؛ ستورک؛ ئەستورک ۳. کلوە بەفری درشت ☰ ۱. خمیر در

تنور سوخته ٢. گرده نان ٣. دانه‌ی درشت برف

**پاتۆر ـ پاتۆر** / pator pator/: ئاوەڵناو. ١. پترۆـپترۆ؛ ڕیشاڵ ـ ڕیشاڵ ٢. شڕ و کون‌ـکون و لەکارکەوتوو ■ ١. شرحه ـ شرحه ٢. سوراخ ـ سوراخ

**پـاتۆره** / patore/: نــاو. ١. کولــووی بـــەفر ٢. سەوقات؛ دیاری ■ ١. دانه‌ی برف ٢. ارمغان

**پاتۆز** / patoz/: ناو. ماشێنی دروێنە ■ کُمباین

**پـاتۆڤ** / patov/: نـاو. گیایەکـە زرو وەک قاشـاغ، یەکسمی پێ دەماڵن ■ گیاهی زِبر

**پاتۆق** / patoq/: ناو. شوێنی کۆبوونەوە ■ پاتوق

**پـاتۆڵ** / patoł/: نـاو. پـانتۆڵ؛ پانتـرۆن؛ پانتـرۆڵ؛ شەڵوار؛ شەرواڵ؛ ڕانکی لە قوماش ‹کەوا و پـاتۆڵ، ئەسپی چاک/ لە دواڕۆژ بێ ترس و باک «هـەژار، *بـۆ کوردستان*»› ■ شلوار

**پاتۆڵـە** / patołe/: نــاو. کـــولێرە؛ ســـتورک؛ ئەستوورکە ■ گرده نان

**پاتۆڵێ** / patołê/: ناو. پـاتۆڵ؛ شـواڵ؛ شاڵـوار ■ شلوار

**پاتۆنیا** / patonya/: ناو. گوڵێکی دەرمانییـە ■ از گیاهان دارویی

**پاتـووک** / patûk/: ئاوەڵناو. پرتووکـاو؛ پـواو؛ ڕزیـو؛ داڕزیاگ ■ پوسیده

**پاتە**[1] / pate/: ناو. ١. کەوشـی چـەک و شـڕ ٢. پاتی؛ گاڵۆش؛ کەوشـی لاسـتیک ٣. ورتکـەنان؛ وردەنان ٤. بەرماو؛ پاشماوە ٥. پینە؛ پنوو؛ پـنی؛ پارچەیەک کـە بـە سـەر دڕاویـدا دەیـدروون ٦. سلاو؛ مەرحـەبایی ٧. گۆشـتاو؛ ئاوگۆشـت ■ ١. کفش پاره ٢. گالُش ٣. ریزه‌نان ۴. پس‌مانده ۵. وصله ۶ سلام ٧. آبگوشت

⊡ **پاتە کرن**: پینە کردن ■ وصله کردن

**پاتە لێخستن**: سلاو لێ‌کردن ■ سلام کردن

• **پاتە**[2]: پاشەوشە. ـ پات؛ ـبارە؛ ـجارە ‹دووپاتە› ■ ـ باره

**پاتەخت** / patext/: ☜ **پیتەخت**

**پاتەختی** / patextî/: ناو. ١. مێزی پچووکی پـەنا تەختەخەو (قەرەوێڵە) ٢. دیاری خزم و خوێش بۆ بووک و زاوا دوای زەماوەندیان ■ ١و٢. پاتختی

**پاتـەخۆر** / patexor/: ئاوەڵناو. ١. بـەرماوخۆر ٢. *[پـلار]* چڵـــکاوخوەر؛ خۆفرۆشـــی خوێـــڕی و سەرسواڵکەر ■ ١. ریزه‌خوار ٢. خودفروشِ گدامنش

**پاتەران** / pateran/: ناو. وڕاوە ■ هذیان

**پاتەی** / patey/: چاوگ. هۆرپاتەی؛ هەڵـپەرتاوتن ■ چیدن و بُریدن

**پاتی** / patî/: ☜ **پاتە**[1]**ـ٢**

**پاتیل**[1] / patîl/: ناو. ١. ☜ **پاتیلـە** ٢. سـوێنەی هەویر شێلان ■ ١. ☜ **پاتیله** ٢. پاتیل خمیر

**پاتیل**[2]: ئاوەڵناو. ڕەشەمەست ■ مستِ پاتیل

**پاتیلۆک** / patîlok/: ناو. کەباب؛ گۆشتی بـرژاو ■ کباب

**پاتیلە** / patîle/: نـاو. پاتیـل؛ پـاتێل؛ مەنجەڵـی بچووک؛ بەرۆشی گچکە ■ دیگ کوچک

**پاتێل** / patêl/: ☜ **پاتیلە**

**پاجڤە** / pac(i)ve/: ☜ **پاچڤە**

**پاجە** / pace/: نـاو. پـەنجێرە؛ پەنجـەرە؛ دەلاقـە؛ دەرووەچە ■ پنجره

**پـاچ**[1] / paç/: ناو. ١. قەزمە؛ کوڵـینگی یـەک دەم ‹دوور لە تۆ دایم ئەناڵـم وەک نەخۆشـی بێـتـەبیب/ چاوەڕێی ئاوازی دەنگی خاکەناز و پاچـــمە «نـاری»› ٢. ماچ؛ کاری ڕامووسان ٣. کۆنەپـەڕۆ ٤. کـراس ■ ١. نوعی کلنگ ٢. بوسه ٣. کُهنه ۴. پیراهن

▣ **پاچ دوسەرە**: قولنگە؛ پاچی دوودەم کە زۆرتـر سەرێکی پانە ■ کُلنگ

**پاچ زمنگن**: پاچی یەک‌دەم و نووسکن ■ نـوعی تیشە

⊡ **پاچ کرن**: ماچ کردن؛ ڕامووسین ■ بوسیدن

**پاچ وشاندن**: پاچ لـە جێگایـەک دان ‹ئێمـەش

ناچار بەم شان ـ بەو شان/ بێ‌پشوو پاچمان ئەوەشان› 🇮🇷 کُلُنگ زدن

• **پاچ**[٢]: پاشوشە. پاچەر ‹دارپاچ› 🇮🇷 ـ پیرا؛ پیراینده

**پاچاڵ** / paçał/: ناو. ١. پێچاڵ؛ قولکەی ژێر پای جۆلا ٢. شوێنی چاڵ لە چاو دەوروبەری 🇮🇷 ١. پاچال ٢. چاله

**پاچاندنەوە** / paçand(i)newe/: چاوگ. پەرچ کردن؛ پەرچاندنەوەی وەک تەنەکە و بزمار 🇮🇷 پرچ کردن

**پاچرا** / paç(i)ra/: ناو. ١. پێ‌چرا؛ پێچکی لە دار یان لە قوڕ بۆ قوتیلکە چرا ٢. ئەو پارە لە قوماردا دەدرێ بە خاوەن قومارخانە 🇮🇷 ١. پاچراغ ٢. پولی کە قماربازها بە قمارخانە می‌پردازند

**پاچران** / paç(i)ran/: چاوگ. تێنەپەڕ. //پاچرای؛ دەپاچرێی؛ بپاچرێ// چنیان؛ ڕنیان 🇮🇷 چیده شدن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: پاچراو/ چاوگی نەرێنی: نەپاچران

**پاچرانەوە** / paç(i)ranewe/: چاوگ. تێنەپەڕ. //پاچرایەوە؛ دەپاچرێیەوە؛ بپاچرێوە// بریانەوە 🇮🇷 چیده شدن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: پاچراوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەپاچرانەوە

**پاچرکێ** / paçirkê/: ☜ **پاچڕکێ**

**پاچڕکێ** / paçiřkê/: ناوەڵکار. پێ‌دزە؛ پێ‌خشکە؛ پێ‌دزکێ؛ پاچرکێ؛ بە خشکە؛ قولەپسکێ؛ بزدم؛ تەلە ـ تەلە؛ ماتەمات؛ پسوو ـ پسوو؛ هێدی و بێ‌چرکە 🇮🇷 پاورچین

**پاچڤە** / paç(i)ve/: ناو. پاچەڤە؛ پاجڤە؛ کاری وەرگێڕان 🇮🇷 ترجمه

**پاچڤەکار** / paç(i)vekar/: ناو. تەرجمان؛ چێورکار؛ وەرگێڕ 🇮🇷 مُترجم

**پاچڤەکراو** / paç(i)vek(i)raw/: ناوەڵناو. وەرگێڕاو؛ وەرگەڕاو 🇮🇷 ترجمەشده

**پاچک** / paçik/: ناو. ١. پێ؛ پا ٢. پەڕۆی لەت و شڕ ٣. دەسەگیرەی ئاشپەزخانە ٤. پاچکە؛ پایە 🇮🇷 ١. پا ٢. کُهنه ٣. دستگیرەی آشپزخانه ۴. پایه

**پاچکاری** / paçkarî/: ناو. کاری زەوی کۆڵین بە پاچ 🇮🇷 کلنگ‌کاری

**پاچکە** / paçke/: ناو. ١. پاچک؛ پێچک؛ پایە ٢. پێ؛ پاچە؛ پێچک؛ پاچەی سەروپێ ٣. بەلەک؛ ساق 🇮🇷 ١. پایه ٢. پاچەی کلّەپاچه ٣. ساق پا

**پاچلە** / paçile/: ناو. سنگی تەنافی ڕەشماڵ 🇮🇷 میخ رسن سیاه‌چادر

**پاچناڤ** / paçinav/: ناو. ١. نازناو؛ ناوێ کە خەڵک بە کەسێکیەوە دەنێن ٢. ناوی هەڵبژاردە؛ ناوێ کە کەسێ بۆ خۆی هەڵیدەبژێرێ 🇮🇷 ١. لقب ٢. تخلُّص

**پاچولکە** / paçûlke/: ناو. پاچەکۆڵە؛ قەزمەی بچووکی دەستی باخەوان 🇮🇷 قزمەی باغبانی

**پاچە** / paçe/: ناو. ١. سەروپێ؛ کەلەپاچە ٢. پەڕۆ ٣. پەنجەرە؛ دەلاقە 🇮🇷 ١. کلەپاچه ٢. کهنە پارچە ٣. پنجره

**پاچەبەند** / paçebend/: ناو. پاوەن؛ زنجیری پای زیندانی ‹دیتن خوە ب پاچەبەند و زەنگل/ پەرواز و فڕین مەحال و موشکل «خانی»› 🇮🇷 پابند زندانی

**پاچەچی** / paçeçî/: ناو. سەلک و پێچک‌فرۆش بە کولاوی 🇮🇷 کلّەپز

**پاچەڤە** / paçeve/: ☜ **پاچڤە**

**پاچەقول** / paçequl/: ☜ **پاشقول-١**

⊡ **پاچەقول لێدان**: پێ دانە بەر پێی کەسێک بە مەبەستی خستنی 🇮🇷 لِنگ کردن

**پاچەقولێ** / paçequlê/: ناو. ١. جومگەی پا؛ بەرگوێزنگ؛ سەری قولەقاپە ٢. ☜ **پاشقول-١** 🇮🇷 ١. مچ پا ٢. ☜ **پاشقول-١**

⊡ **پاچەقولێ دان**: پێ دانە بەر پێ؛ پێ لە پێ پێچان بە مەبەستی ڕماندن 🇮🇷 لِنگ کردن

**پاچەک / paçek/**: ناو. تەپاڵە؛ ڕیخی وشکەوەبوو ☰ تپالە

**پاچەکوڵە / paçekułe/**: ناو. شەنکێش؛ چەوکێش ☰ شن‌کش

**پاچەکۆڵە / paçekołe/**: ناو. پاچوولکە؛ قەزمەی بچووکی دەستی باخەوان ☰ قزمەی باغبانی

**پاچین / paçîn/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //پاچیت؛ دەپاچی؛ بپاچە// ١. بە مەقەست بڕین و ڕێکوپێک کردن ‹سەر پاچین› ٢. خوار کردنەوەی وەک بزمار و ... ☰ ١. قطع کردن؛ برش دادن ٢. پرچ دادن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: پاچیاگ/ چاوگی نەرێنی: نەپاچین

⊡ **پاچین کردن**: قەشارتن؛ شاردنەوە ☰ پنهان کردن

**پاچینگەه / paçîngeh/**: ناو. گرد؛ تەپۆڵکە ☰ تپەی کوچک

**پاچینە / paçîne/**: ☜ **پەیژە**

**پاچینەوە / paçînewe/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //پاچیتەوە؛ دەپاچییەوە؛ بپاچەوە//هەڵپاچین؛ قاچینەوە؛ تاشین ☰ ستُردن؛ تراشیدن (مو)

■ ناوەڵناوی بەرکاری: پاچیاگەوە/ چاوگی نەرێنی: نەپاچینەوە

**پاخ / pax/**: ناو. ١. پەڕۆ؛ پارچەی کۆنە ٢. ترس؛ سام ☰ ١. کهنە ٢. ترس

**پاخان / paxan/**: پێرۆ. ← **چاخان‌وپاخان**

**پاختە / paxte/**: پێرۆ. ← **ساختەوپاختە**

**پاخر / paxir/**: ناو. مس ☰ مس

**پاخراو / pax(i)raw/**: ناوەڵکار. پێخاوس؛ پێخواس؛ پایەتی ☰ پابرهنە

**پاخرکەر / paxirker/**: ناو. مسگەر ☰ مسگر

**پاخس / paxs/**: ناو. ژەنگ؛ غەور ☰ زنگ

**پاخلێر[١] / paxlêr/**: ناو. کاکڵەگوێز ☰ مغز گردو

**پاخلێر[٢]**: ناوەڵناو. پاقلیر: ١. تاس؛ تووک وەریو ٢. تراشراو ‹گرتیان سەریان پاخلێر کرد!› ☰ ١. تاس ٢. تراشیدە

**پاخڵ / paxił/**: ناو. ١. باخەڵ؛ بەخەڵ ٢. گیرفان؛ گیفان؛ بەریک ☰ ١. بغل ٢. جیب

**پاخوا / pax(i)wa/**: ناو. ١. پێخوێ؛ ئەندازەیەک قوڕ و کا (کاگڵ) بۆ ڕۆژەسواغێک ٢. ئەو کلۆشەی خراوەتە بەرپێ بۆ گێرە کردن ٣. دەغڵێ کە شەن‌کراوە و کای تێدا نەماوە ٤. کۆمەڵێک شتی سەر یەک خراو ☰ ١. مقدار کاهگل آمادە برای یک روز کار ٢. خرمن نیمکوب شدە ٣. خرمن بدون کاە ۴. تودەی انباشتە

**پاخوڕ / paxuř/**: ناو. پاشاخوڕ ☰ پسماندەی آخور

**پاخوشە / pax(i)weşe/**: ناو. پاشێل؛ پاکوت؛ پێشێل ☰ لگدمال

**پاخۆشە / paxoşe/**: ناوەڵناو. پێخوست؛ بەرپێدراو؛ لە بەر پێ وردبوو ☰ لگدمال شدە

**پاخەسو / paxesû/**: ☜ **پێخەسو**

**پاخەسور / paxesûr/**: ☜ **پێخەسو**

**پاخەڵ / paxeł/**: ناو. باخەڵە؛ گیرفان ☰ جیب

**پاخەند / paxend/**: ناو. یاقووت؛ پاکەند ☰ یاقوت

**پاخێڵ / paxêł/**: ناو. عەرابەی لادێ ☰ عرادەی روستایی

**پادار[١] / padar/**: ناو. کۆتەرەدار ☰ تنەی درخت

**پادار[٢]**: ناوەڵناو. ١. خاوەن پا ‹پادارا گێردێ، بێ پای هێنێ وێمانێ «مەسەل»› ٢. پایەدار و بەرقەرار ٣. *[کینایە]* تون؛ خێرا ☰ ١. پادار ٢. برقرار و پایدار ٣. بادپا

⊡ **ئادار بە سەر پادارەوە نەهێشتن**: ورد و وێران کردن؛ خاپوور بوون ‹نایەڵن ئادار بە سەر پاداری ئەو دەربارەوە/ چونکوو دەیگوت نایەڵم ئاداری کورد، پاداری کورد! «هێمن»› ☰ ویران کردن

**پادارانە / padarane/**: ناو. باجێ کە بۆ لەشکرکێشی لە خەڵکی دەستێنن ☰ باج

لشکرکشی

**پاداری / padarî/**: ناو. باوەرێن؛ بارێز؛ بارێزە؛ وارێزە؛ بارن؛ باڤەرینگ؛ میوەی داوەریوی پای دار ☰ پادرختی

**پاداش / padaş/**: ناو. ڕێزانە؛ خەلات؛ پاداشت؛ کاری چاکە دانەوە ‹بێ‌فەر کە بە چاکە نەدرێ پاداش/ جیاوازی بە چی بێ باش و نباش؟ «هەژار، *مەم و زین*»› ☰ پاداش

**پاداشت / padaşt/**: ☜ **پاداش**

**پاداڤ / padav/**: ناو. ١. پاداو؛ تەپکە ٢. کەوی بنە ☰ ١. دام ٢. کبک شکاری

**پاداو / padaw/**: ناو. پێداو: ١. تەلە؛ تەپکە ٢. چەرمێکی بە ئالقە لە قاچی دەبەستن بۆ بە دارا هەڵچوون ☰ ١. دام؛ تله ٢. حلقەی چرمی کە بە پای بندند تا از درخت بالا روند

**پادزن / padzin/**: ناو. فیلتر؛ پاڵوێنە ☰ فیلتر

**پادزە / pad(i)ze/**: ناوەڵکار. پێ‌دزکێ؛ پێ‌دزە ☰ پاورچین

**پادسن / padsin/**: ئاوەڵناو. تازەپیر؛ لە سەرەتای سەردەمی پیریدا ☰ نوپیر

**پادشا / padşa/**: ناو. پاشا؛ پاوشا؛ پالشا؛ پاتشا ‹وات بنویس نۆفەڵ خەیاڵت چێشەن/ هەر کەس نە جای وێش پادشای وێشەن «خانای قوبادی»› ☰ پادشاه

**پادشایی / padşayî/**: ناو. پاشایەتی؛ شایی ☰ سلطنت

**پادەشت / padeşt/**: ناو. پێ‌دەشت؛ دەشتی بنار؛ بەرداوێنی چیا ☰ دامنەی کوه

**پادەشتی / padeştî/**: ناو. دەشتی بەر کێو ☰ جلگەی دامنەی کوه

**پادینگ / padîng/**: ناو. سندوڵ؛ بەشە قووڵەکەی دینگی چەڵتووک ☰ بخشی از ابزار شالیکوب

**پار[1] / par/**: ناو. ١. ساڵی پێشوو ‹ئەزانێ یار خۆی، کام هەژار، ڕۆژێ سەد جار/ ئەکا هاوار: خۆزگەم بە پار، خۆزگەم بە پار! «گۆران»› ٢. بەش؛ پاژ؛ پارچە ‹هەر یەک لە بەزەت بە پار و پشکە/ تیشکت لە هەچی نەداوە وشکە «هەژار، *مەم و زین*»› ٣. کلافە دەزوو ٤. پووش؛ ئالف؛ لەوەڕ ٥. ☜ **پاڵ[1]** ☰ ١. پارسال ٢. قسمت؛ جزء ٣. کلافە نخ ۴. علف ۵. ☜ **پاڵ[1]**

⊡ **پار کرن**: بەش کردن ☰ تقسیم کردن

**پار[2]**: ئاوەڵکار. پارەکە؛ لە ساڵی پێشوودا ‹پار بێکار بووم› ☰ پارسال

**پار ـ[3]**: پێشوشە. ١. پاش؛ دوا ‹پاردوو› ٢. پارچە؛ بەش؛ پاژ ‹پارسەنگ› ☰ ١. پس، مقابل پیش ٢. بخش؛ قسمت

**پارادایم / paradaym/**: ناو. وێنە؛ نموونە؛ شتێ کە نیشاندەری کۆمەڵێکی وەک خۆیەتی ☰ پارادایم

**پارادوکس / paraduks/**: ناو. ناتەبایی؛ نارێکی: ١. بابەتێ کە بە ڕواڵەت دەگەڵ عەقڵدا ناگونجێ ٢. وتەیەکی ناتەبا کە لە سەرەتاوە ڕاست دەنوێنێ ☰ ١و٢. پارادُکس

**پارازتن / paraztin/**: ☜ **پاراستن**

**پارازۆ / parazo/**: ناو. پازگر؛ ئێشکچی؛ پاسەوان ☰ نگهبان

**پارازیت / parazît/**: ناو. ١. لامژ؛ لاکوت؛ چەورە؛ تەکمیش ٢. دەنگی زیادی و سەر لێ‌شێوێن ☰ ١و٢. پارازیت

⊡ **پارازیت خستن**: شەپۆلی دەنگ و ڕەنگی تر خستنە سەر دەنگ و ڕەنگی سەرەکی بۆ شێواندنی ☰ پارازیت انداختن

**پاراستن / parastin/**: چاوگ. تێپەڕ. //پاراستت؛ دەپارێزی؛ بپارێزە// پارازتن؛ پارێزتن؛ ئاگاداری کردن ‹پێت دەڵێ نووکی قەڵەم: نووکی قەڵەم/ زۆر لە شیر باشتر دەپارێزێ عەلەم «هێمن»› ☰

نگهداری کردن
■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپاراستن

**پاراسته** / parasteـ/: ئاوەڵناو. پارێزراو ☰ مُحافظت شده

**پاراشوت** / paraşût/: ناو. پاراشووت؛ پەڕەشووت؛ چەتری نەجات ☰ چتر نجات

**پاراف** / paraf/: ناو. واژۆ؛ ئیمزا ☰ امضا

**پارافین** / parafîn/: ناو. جۆرێک چەورییە لە نەوت چێ دەکرێ و پێستی دەست و ڕوومەتی پێ چەور و نەرم دەکەن ☰ پارافین

**پاراگراف** / parag(i)raf/: ناو. بەشێ لە نووسراوە کە لە بابەتێ دەدوێ ☰ پاراگراف

**پارانگوێن** / parang(i)wên/: ناو. گوێلپار؛ پانێر؛ پارێنە ☰ گوسالەی پارینە

**پاراو**[1] / paraw/: ناو. ئاوخۆرگە؛ دەراف؛ شوێنی ئاودانی ئاژەڵ ‹لە بەر بێر و لە هاوێر و لە پاراو/ گەلێکم دیوە کیژی شۆخی کرمانج «هێمن»› ☰ آبشخور

**پاراو**[2]: ئاوەڵناو. ١. تێراو؛ پڕئاو ‹ئێوەش شوێنی مە ڕەچاو کەن/ نیشتمان بە خوێن پاراو کەن «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ٢. شەق و تورت و گەش ‹هەرکەسێکی کەوا سەناگۆتە/ تەڕ و پاراوە تەبع و زار و لەبی «شاوات»› ٣. *[مەجاز]* بێ‌کەمایەسی و خاوەن هەموو تایبەتمەندییەکی پێویست ‹هۆهۆ شوانە! بە نەغمەی تەڕ و پاراوت/ بە بلوێری لە خەم و دەردا سووتاوت «سوارە»› ☰ ١. سیراب ٢. شاداب ٣. بی‌نقص

⊡ **پاراو بوون** ١. تێراو بوون ٢. بە گەش بوون ☰ ١. سیراب بودن ٢. شاداب بودن

**پاراو کردن** تێراو کردن ☰ سیراب کردن

**پاراوی** / parawî/: ناو. ١. تێراوی؛ تەڕ و بەڕی ٢. بێ‌نیازی؛ تێر و تەسەلی ٣. پێگەیشتوویی؛ پوختەیی ☰ ١. شادابی ٢. بی‌نیازی ٣. پُختگی

**پارپارە** / parpare/: ناو. پەڵپینە؛ گیای پرپرە ☰ گیاه خُرفه

**پارت** / part/: ناو. ١. دەستە؛ کۆمەڵ ٢. حیزب؛ دامەزراوەیەکی ڕامیاری کە خەڵک لە سەر ئامانجەکانی ڕێک دەخا ☰ ١. گروه؛ دسته ٢. حزب

**پارتی** / partî/: ناو. ١. واسیە؛ واستە؛ داژدار؛ پشتگر؛ پشتەمێر؛ پاڵپشت؛ لایەنگیر؛ ژێرمرکێ؛ داڵتە؛ پشتیوانی بە دەسەڵات ٢. جۆرێک میوانی بە شێوەی ڕۆژاوایی هاوڕێ لەگەڵ سەما و مۆسیقادا ٣. ئەو کالایە کە بە یەکجاری دەگاتە دەستی کڕیار ☰ ١تا٣. پارتی

**پارتیشن** / partîşin/: ناو. دیوارۆکە یان چیغێ کە ژوورێک دەکاتە دوو کەرت ☰ پارتیشن

**پارچ**[1] / parç/: ناو. ١. گاسن؛ گاوەسن ٢. قەزمە؛ پاچ ٣. تۆنگ؛ گۆزەڵە ☰ ١. گاوآهن ٢. کلنگ ٣. پارچ

**پارچ**[2]: ئامراز. بەم جۆرە ☰ این‌طور

**پارچک** / parçik/: ناو. شەمشەمەکوێرە ☰ خُفاش

**پارچۆکە** / parçoke/: ناو. پرت؛ کلۆی چووک ☰ کلوخک

**پارچە** / parçe/: ناو. ١. پاژ؛ لەت ٢. کووتاڵ؛ قوماش ☰ ١. قطعه ٢. پارچه

**پارچە ـ پارچە** / parçe parçe/: ئاوەڵناو. لەت ـ لەت ‹کورد دەمێکە گورز و قەڵغانی بیانی بەر سەرە/ پارچە ـ پارچە و بەش‌خوراو و بێ‌سەر و بێ‌سەروەرە «موفتی پێنجوێنی»› ☰ تکه ـ تکه

⊡ **پارچە ـ پارچە بوون** لەت ـ لەت بوون؛ دابەش بوون؛ بوون بە چەن بەشەوە. هەروەها: **پارچە ـ پارچە کردن** ☰ تکه ـ تکه شدن

**پارچەپینە** / parçepîne/: ناو. پاتک؛ پارچەپینە ☰ وصلەی پارچه

**پارچەچی**[1] / parçeçî/: ناو. کووتاڵفرۆش؛ پارچەفرۆش ☰ بزّاز

**پارچەچی**[۲]: ئاوەڵناو. ئاوانتەچی؛ خۆهەڵکێش ☰ لافزن

**پارچەفرۆش** / parçef(i)roş/: ناو. پارچەچی؛ کووتاڵفرۆش ☰ بزاز

**پارچەفرۆشی** / parçef(i)roşî/: ناو. ١. کار و پیشەی پارچە فرۆشتن ٢. دووکانی پارچە فرۆشتن ☰ ١و٢. پارچەفروشی

**پارچەکراو** / parçek(i)raw/: ئاوەڵناو. دڕاو؛ گەزخی ☰ پارە شدە

**پارچەگۆشت** / parçegoşt/: ناو. گۆشتپارە؛ گرتکە ☰ تکەگوشت

**پارچەڵان** / parçełan/: ناو. شرکەڵان؛ تۆقەڵان؛ ئەو شوێنەی ماشێنی شکاو و هەڵوەشاوەی لێ ڕۆ دەکەن ☰ اوراقی

**پارچەڵۆک** / parçełok/: ناو. پارچە؛ لەتێکی بچووک ‹لەم پارچەڵۆکە هەورە، بە قەد ڕووی هەموو زمین/ بەم ڕایەڵە قەدیفەی سەوزی، عەجەب تەنی! «نالی»› ☰ تکەی کوچک

**پارچینە** / parçîne/: ناو. پلیکان؛ پلەکان ☰ پلکان

**پارچێمک** / parçêmik/: ناو. شەمشەمەکوێرە ☰ خُفاش؛ شب‌پره

**پارخان** / parxan/: ناو. ١. پارووخان؛ پەرەکە؛ پەراسوو ٢. پەردەی ناسکی ژێر چەرم ☰ ١. دندە ٢. پردەی نازک زیر چرم

**پارخخە** / parxixe/: ناو. نەخۆشی لاقی مالات ‹ئەڕا ڕێ نیەکەی؟ پارخخە گرتیەدە؟› ☰ از بیماری‌های دام

**پارخۆن** / parxon/: ☜ پارخونە

**پارخونە** / parxûne/: ناو. پارخۆن؛ ماسوولکە؛ مایچە ☰ ماهیچە

**پارخێل** / parxêl/: ناو. گاری؛ عەرەبانەی لە سەر دوو چەرخ کە ئەسپ یان تەراکتور دەیکێشێ ☰ گاری

**پاردوو** / pardû/: ناو. پالوو؛ ئەو ئالقە یا ئەو گوریسە کە بن کلکی یەکسم دەگرێ ☰ پاردُم

**پاردە** / parde/: ناو. ١. سیپە؛ حەشارگە؛ ڕەبەت؛ بەسەی ڕاوکەر ‹تەزووی گەرمم بە لەشدا دێ ئەگەرچی/ تەزاندی شان و پیلم بەردی پاردە «هێمن»› ٢. خەندەک؛ خەنەق ٣. دیواری کورت ٤. وشکەچن؛ وشکەکەڵەک؛ دیواری هەڵچنراو بە وشکەبەرد ‹بەڵێنی ڕاگەیاندی ڕاسپاردە/ وتی بۆت دێتە بن ئەو پاردە، غار دە! «هێمن»› ☰ ١. کمین شکارچی ٢. خندق ٣. دیوار کوتاە ٤. سنگ‌چین

**پارزن**[۱] / parzin/: ناو. پارزنگ؛ پارزۆن؛ پارزوون؛ پارزونک؛ پارزونگ؛ پارزینک؛ پارسۆن؛ پالوێنە؛ ڕاوک ☰ پالونە؛ پرویزن

• **پارزن**[۲]: پاشەوشە. ـ پالێو ‹چاپارزن؛ پلاوپارزن› ☰ صافی

**پارزنگ** / parzing/: ☜ پارزن[۱]

**پارزنین** / parzinîn/: چاوگ. پالاوتن؛ پالفتە کردن ☰ پالودن

**پارزونک** / parzun(i)k/: ناو. ١. کوڵوانە ٢. ☜ پارزن[۱] ☰ ١. رودوشی ٢. ☜ پارزن[۱]

**پارزونگ** / parzun(i)g/: ☜ پارزن[۱]

**پارزۆن** / parzon/: ☜ پارزن[۱]

**پارزوون** / parzûn/: ☜ پارزن[۱]

**پارزینک** / parzînik/: ☜ پارزن[۱]

**پارسا** / parsa/: ناو. هەبیس؛ تەرکەدنیا؛ مرۆی چاکی دوورەدنیا ☰ زاهد

**پارساک** / parsak/: ناو. سواڵکەر؛ دەرۆزەکەر ☰ گدا

**پارستن** / paristin/: چاوگ. بەش کردن ☰ قسمت کردن

**پارسۆن** / parson/: ☜ پارزن[۱]

**پارسوو** / parsû/: ☜ پەراسوو ـ ۱

**پارسووستوور** / parsûstûr/: ئاوەڵناو. [کینایە]

خۆبەزل‌زان؛ بەدەمار ⊑ مغرور

**پارسە** / parse/: ناو. سواڵ؛ گەدایی؛ خوازەڵۆکی ⊑ گدایی

**پارسەک** / parsek/: ناو. سواڵکەر؛ گەدا؛ خوازەڵۆک ‹پارسەکێک خۆی کوتایە هەیوانێک/ وتی برسیم لە ڕێی خودا نانێک «هەژار، بۆ *کوردستان*»› ⊑ گدا

**پارسەکی** / parsekî/: ناو. دەرۆزە؛ سواڵکەری؛ گەدایی ⊑ گدایی

**پارسەنگ** / parseng/: ناو. پاسەنگ؛ پاڵسەنگ: ۱. کۆمەگی بەردی تەرازووی سووک ‹تەرازووی تاعەتت لەنگە، هەتا کەی ئەم سەر ئەو سەرتە؟/ بە پارسەنگی حەیا دەس هەڵبرە بنوارە میزانی «حەریق»› ۲. کاری تۆزێ گران کردنی تەرازوو لە بەر خاتری کڕیار ⊑ ۱. پارسنگ ترازو ۲. خاطرانەی مشتری

**پارشەو** / parşew/: ناو. ۱. نیمەی دووهەمی شەو ۲. پارشێو؛ دووهەم شێوی ڕۆژووەوان ⊑ ۱. بعد از نیمە شب ۲. سحری

**پارشێو** / parşêw/: ناو. پارشەو ⊑ سحری

⊡ **پارشێو کردن**: ژەمی پارشێو خواردن ‹ئەوا بەم حاڵە شەویشمان ڕابورد/ چووینەماڵەوە پارشێویشمان کرد «بێکەس»› ⊑ سحری خوردن

**پارشێوکەران** / parşêwkeran/: ناو. کاتی پارشێو و هەستانەوە بۆ پارشێو کردن ‹وەتەن مژدە بێ پارشێوکەرانە/ تاریکی نەما بەرەو بەیانە «قانع»› ⊑ سحری

**پارک** / park/: ناو. ۱. سەیرانگای بە دار و درەخت و گوڵ، جێگای یاری کردنی منداڵان و سانەوەی خەڵک ۲. کاری ڕاگرتنی ماشین لە شوێنی تایبەتدا ⊑ ۱و۲. پارک

⊡ **پارک کردن**: ڕاوەستاندن؛ ڕاگرتن؛ دانان و (زۆرتر) بەجێ‌هێشتنی کەرەسەی هات‌وچوو لە شوێنێک ⊑ پارک کردن

**پارکۆڵە** / parkołe/: ناو. بێچووی دوو ساڵەی ورچ و بەراز و ... ⊑ تولەی پارینەی خرس و گُراز و ...

**پارکە** / parke/: ناو. کەرد؛ پارگە؛ دووکان؛ کەردوو؛ تەختەی چێندراو ⊑ کرت؛ قطعە زمین کاشتە شدە

**پارکەر**[1] / parker/: ☜ **پارگیر**

**پارکەر**[2]: ناوەڵناو. بەشکەر ⊑ تقسیم‌کنندە

**پارکینگ** / parkîng/: ناو. ۱. گاراج؛ شوێنی پارک کردن و ڕاگرتنی ماشین لە ماڵ ۲. شوێنی ڕاگرتنی ماشینان لە دەر ⊑ ۱و۲. پارکینگ

**پارگوێر** / parg(i)wêr/: ناو. پاروونەک؛ پارگۆل؛ پارگوێل؛ پارین؛ پانێر؛ پارینە؛ گۆلکی پار؛ بەچکە چێلی دووساڵە ⊑ گوسالەی پارینە

**پارگوێل** / parg(i)wêl/: ☜ **پارگوێر**

**پارگۆل** / pargol/: ☜ **پارگوێر**

**پارگۆن** / pargon/: ☜ **پاروێنکە**

**پارگە** / parge/: ☜ **پارکە**

**پارگیر** / pargîr/: ناو. پارکەر؛ پارهەڵکەر؛ کلافەگر؛ تەختەیەکە سێ قوچکەی تێ‌بڕاوە، کەلافی دەزووی لە سەر هەڵدەکەن ⊑ کلافەگیر

**پارگین**[1] / pargîn/: ناو. ۱. ☜ **پارگین** ۲. پارۆنیک؛ خەندەکی دەوری ماڵ بۆ بەرگری لە دزەی ئاو ۳. ☜ **پاروێنکە** ⊑ ۱. ☜ **پارگین** ۲. خندق نمگیر اطراف ساختمان ۳. ☜ **پاروێنکە**

**پارگین**[2]: ناوەڵناو. پارین؛ پارەکەیین؛ پێوندیدار بە پارەکەوە ⊑ پارسالی

**پارگێن** / pargên/: ناو. پارگین؛ پارزن ⊑ پالونە

**پارلمان** / parliman/: ناو. پەرلەمان؛ ئەنجومەن؛ کۆڕی نوێنەرانی خەڵک بۆ دەستوور دانان و چاودێریی دەوڵەت ⊑ پارلمان

**پارم** / parim/: ناو. گیایەکی دەشتەکییە،

دەخورێ 🇮🇷 از گیاهان خوارکی صحرایی

**پاروا** / parwa/: ناو. کێلگەیێ کە دێر دەگا 🇮🇷 کشتزار دیررس

**پاروشک** / paruşk/: ناو. کلتوور لە پێستی ڕانی کەڵەباب 🇮🇷 سُرمەدان از پوست ران خروس

**پاروێنک** / parwênik/: ☜ **پاروێنکە**

**پاروێنکە** / parwênke/: ناو. پارگۆن؛ پارگین؛ پاروێنک؛ پارێنکە؛ دڕگەی دەوری چیغ و چادر بۆ بەرگری لە چوونە ژووری ئاوی باران 🇮🇷 کانال آبگیر دورادور چادر

**پارۆنە** / parone/: ناو. مریشک و مراوی و بۆقلەی دووساڵە 🇮🇷 ماکیان دوساله

**پارۆنیک** / paronîk/: ناو. پارگین؛ خەندەکی دەوری ماڵ بۆ بەرگری لە دزەی ئاو 🇮🇷 جوب یا خندق زهکشی اطراف ساختمان

**پارو** / parû/: ناو. تیکە: ١. لوقمە؛ پاری؛ گەیەک؛ ئەوەندەی خۆراک کە بە جارێک لە زار دەنرێ ‹ئەی بزن سادە بژی، بۆ ورگی/ وەکوو مـن خۆ مەکە پارووی گورگی «حەقیقی»› ٢. لوقمە؛ بابۆڵە؛ قەواڵە؛ لوولە؛ پێخۆرێ کە لە پارچەیەک نان پێچراوەتەوە ٣. *[مەجاز]* لوقمە؛ خواردنێکی کەم ٤. پارچە؛ بەش 🇮🇷 ١تا٣. لُقمه ۴. جزء؛ بخش

◘ **پارو بادان**: هەڵخستن؛ زۆر و بەهەڵپە خواردن ‹پێش ئەوەی گزیری بەدفەڕ لە دیوەخان پاروو بادا/ پێش ئەوەی خاتوونێک بە ناز پەردەی کۆشکی ئاغا لادا «هێمن»› 🇮🇷 لُمباندن

**پارو گرتن**: تیکە گرتن 🇮🇷 لُقمه گرفتن

**پارو گلاندن**: تیکە زل گرتن 🇮🇷 لُقمەی بزرگ گرفتن

**پارووبژێر** / parûb(i)jêr/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* ڕژد و بەرچاوتەنگ 🇮🇷 خسیس

**پاروخان** / parûxan/: ناو. پەراسوو؛ دەنە 🇮🇷 دنده

**پاروزل** / parûzil/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* پارووگلێن؛ گەپتیکە؛ فرەخۆر 🇮🇷 پُرخور

**پاروگلێن** / parûg(i)lên/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* پاروزل؛ لوقمەگەورە؛ گەپتیکە؛ فرەخۆر 🇮🇷 پُرخور

**پارونەک** / parûnek/: ☜ **پارگوێز**

**پارویی** / parûyî/: ئاوەڵناو. وەک پاروو 🇮🇷 لُقمەای

**پاره**[١] / pare/: ناو. ١. پوول؛ دراو؛ دراف؛ جیفە؛ زەڕ؛ دینگی؛ بەرە؛ شتی وەرگیراوی گشتی لە وڵاتێکدا بۆ کڕین و فرۆشتنی کاڵا و ڕاژەگەل، بە نرخێکی دیاریکراوەوە ‹دڵت بۆ پارە، پارە، بیر لە لیرە گیرە دەم بۆ دەم/ سەراپا، ڕەگ بە ڕەگ، ئێسقان بە ئێسقان، موو بە موو کوردم «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ٢. پاژ؛ پارچە؛ لەت ‹بیمە سەد پارە، هەر پارەی وە جای/ هیچ موسولمانی چوو من وە پی نای «شامی کرماشانی»› ٣. کەمترین دراوی تورکان 🇮🇷 ١. پول ٢. جزء ٣. کمترین جزء پول ترکیه

◘ **پارە دەرهێنان**: بە دەست هێنانی پارە 🇮🇷 پول درآوردن

**پارە سپی کردنەوە**: *[مەجاز]* قانوونی نواندنی پارەی پیس 🇮🇷 پولشویی کردن

**پارە کردن**: بەنرخ بوون ‹پاڕانەوە و کەساسی بێکەڵکە، پارە ناکا/ عەزم و سەبات و غیرەت پێویستە لەم زەمانە «بێکەس»› 🇮🇷 ارزش داشتن

**پارە لێداکەوتن**: پارە لێهەڵڕژان؛ پوول لە کوناوجەوە چوونە سەر؛ زۆر دەوڵەمەند بوون 🇮🇷 پول از پارو بالا رفتن

**پارە لێهەڵڕژان**: ☜ **پارە لێداکەوتن**

**پارە ماشینەوە**: *[کینایە]* خاوەنی داهاتی زۆر بوون 🇮🇷 پول پارو کردن

**پاره**[٢]: ئاوەڵناو. شڕ و دڕاو ‹ئەی ڕەفیقانی تەریقەت! دەردی عیشقم چارە کەن/ یا(ن) بە جارێ بمکوژن جەرگم بە خەنجەر پارە کەن! «تاهیر بەگی جاف»› 🇮🇷 پاره

**پاره**[٣]: ئاوەڵکار. بەوێدا؛ بەویا ‹لڤا پارە› 🇮🇷 به آنجا

**پاره ـ پاره** / pare pare/: ئاوەڵناو. ورد ـ ورد؛ شڕ و شیتاڵ؛ ونجڕ ـ ونجڕ ‹وەر ژ قەوسینان بە میزان بێتە دەر جۆتەک خەدەنگ/ دی جگەر بت پارە ـ پارە سینە تارومارە بت «مەلای جزیری»› ☰ پاره ـ پاره

**پارەپەرەست** / pareperest/: ئاوەڵناو. [پلار] ڕەزیل؛ ڕژد ☰ پول‌پرست

**پارەپیس** / parepîs/: ئاوەڵناو. [مەجاز] چرووک؛ ڕژد؛ دەس‌قووچاو؛ چکووس؛ ڕەزیل ☰ خسیس

**پارەخۆشەویست** / parexoşewîst/: ئاوەڵناو. خەپوولی؛ پوول‌پەرست ☰ پول‌پرست

**پارەدار** / paredar/: ئاوەڵناو. دەوڵەمەند؛ زەنگین ‹بێ‌پارە کوشتەی نوێژە/ پارەدار زەینی تیژە «پیرەمێرد»› ☰ پولدار

**پارەستوو** / parestû/: ☜ پەراسوو-۱

**پارەفرۆش** / paref(i)roş/: ☜ پارەگۆڕ

**پارەک** / parek/: ناو. ڕشفەت؛ بەرتیل ☰ رشوه

**پارەکە**[۱] / pareke/: ناو. پار؛ ساڵی پێشوو ‹پارەکە ساڵێکی پرباران بوو› ☰ پارسال

**پارەکە**[۲]: ئاوەڵکار. پار؛ لە ساڵی پێشوودا ‹پارەکە بارانی باش باری› ☰ پارسال

**پارەکەوشانە** / parekewşane/: ناو. پارەیێ کە دەیخەنە نێو کەوشی بووکەوە کاتێ لە ماڵە باوانەوە بۆ ماڵی زاوا دەگوێزرێتەوە ☰ پولی کە هنگام عروسی در کفش عروس می‌گذراند

**پارەکەیین** / parekeyîn/: ئاوەڵناو. پارگین؛ پارین ☰ پارسالی

**پارەگۆڕ** / paregoř/: ناو. پارەفرۆش؛ سەڕاف؛ پوول‌گۆڕەوە ☰ صرّاف

**پارەمۆڵ** / paremoł/: ئاوەڵناو. [پلار] دەوڵەمەند؛ پووڵدار؛ دارا ☰ پولدار

**پارەنگان** / parengan/: ناو. پێ‌مێو؛ پێ‌میوە؛ ئەو دارەی دەیدەنە بەر تەرزی مێو ☰ چوب نگهدارندەی تاک

**پارەهەستوو** / parehestû/: ☜ پەراسوو-۱

**پارەهەڵکەر** / parhełker/: ☜ پارگیر

**پاری** / parî/: ناو. ۱. ☜ پاروو-۱ ۲. گیایەکی دەشتەکییە، دەخورێ ☰ ۱. ☜ پاروو-۱ ۲. از گیاهان خوارکی صحرایی

**پاریا** / parya/: ئاوەڵناو. خراپ؛ کرێت ☰ بد

**پاریخۆر** / parîxor/: ئاوەڵناو. [پلار] چڵکاوخۆر؛ بێگانەپەرست؛ خۆفرۆش ☰ بیگانەپرست

**پاریزان** / parîzan/: ناو. توورەکەی پشت ☰ توبرەی پُشت

**پاریڤ** / parîv/: ناو. ۱. ناشتایی؛ بەرقلیان ۲. جۆرێ کەباب ☰ ۱. ناشتایی ۲. نوعی کباب

**پاریک** / parîk/: ☜ پارۆ

**پارین** / parîn/: ئاوەڵناو. پارگین؛ پێوەندیدار بە پارەکەوە ☰ پارسالی

**پارینە** / parîne/: ناو. پارۆنە؛ مریشکی دووساڵە ☰ مرغ دوساله

**پاریە** / par(i)ye/: ناو. باری؛ لۆسە ☰ اهرُم

**پاریز**[۱] / parêz/: ناو. پەرهێز: ۱. خۆپاریزی؛ دوورەپەرێزی؛ خۆبوێری؛ کاری خۆ پاراستن ‹کە یاری دەرکەوت، بێ ترس و پاریز/ بەرەوپیری فڕی، گرتی لە ئامێز «هێمن»› ۲. کار و ڕەوتی تەکینەوە لە خواردنی برێ خۆراک ۳. هێرش لە ناخافڵ ٤. بێستانی تەڕەکاڵ ‹... بەڵان: من سەرڕاو بووم، پاریزێکم دەنگاوت، لە ئامێزی منیش گیر نەدەبوو، خوززەی دەکرد، خۆی دەکێشاوە بن خەزەڵێ... «فولکلۆر»› ٥. بۆسە؛ کەمین ‹دەمەکەت بێنە، بینێ لە کاریز/ تۆ کەو، من ڕاوچی، بۆت بێمە پاریز «فولکلۆر»› ☰ ۱. پرهیز ۲. رژیم غذایی ۳. شبیخون ۴. پالیز ۵. کمین؛ پاس

⊡ **پاریز بردن** لە ناخافڵ و بە هێواشی بۆچوون؛ هجووم کردن ☰ شبیخون زدن

**پاریز چوون** چوونە پاریزەوە؛ بۆ مەڵاس کردن

لە ناو ڕەبەتدا ‹گەرچی چەند ڕۆژێ بوو تـەعلیمی تفەنگ‌بازی ئەکرد/ ڕۆستەم ئاسا چووە پـارێز لـە یەکێ تیتلـە بیجـاغ! «شـێخ ڕەزا»› ☰ در کمـین نشستن

**پارێز کردن** خۆ دوور خستنەوە لـە کـەس یـان شتێ ☰ پرهیز کردن

**چوونە پارێزەوە** ☞ **پارێز چوون**

• **پارێز**[٢]: پاشەوشە. ئەوەی کاری پاراستنە ‹خۆپارێز؛ وڵات‌پارێز› ☰ ـ پا؛ پسوند پاسداری

**پارێزانـدن** / parêzandin/: چـاوگ. پــارازتن؛ پاراستن ☰ پاسداری کردن

**پارێزانە** / parêzane/: ناو. ڕژیم؛ پارێز ☰ رژیم

**پارێزتن** / parêztin/: ☞ **پاراستن**

**پـارێزدار** / parêzdar/: ئاوەڵناو. ئاگـادار؛ لایـەنگر؛ داژدار. هەروەها: **پارێزداری** ☰ هوادار

**پـارێزران** / parêzran/: چـاوگ. تێنەپـەڕ. نادیـار. //پارێزرای؛ دەپارێزرێی؛ بپارێزرێ// چاوەدێری لێ‌کران ☰ محافظت شدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: پـارێزراو/ چـاوگی نـەرێنی: نەپارێزران

**پارێزڤـان** / parêzvan/: نـاو. ١. بێسـتانەوان ٢. پاسەوان ☰ ١. پالیزبان ٢. نگهبان

**پارێزکار** / parêzkar/: ئاوەڵناو. پارێزگار؛ دینـدار و لەخواترس ☰ پرهیزکار

**پارێزکاری** / parêzkarî/: ناو. چاودێری؛ نیگـاوانی ☰ نگهداری

**پارێزکەر** / parêzker/: ناو. ئەوەی پارێز دەکـا ☰ اهل پرهیز

**پارێزگـا** / parêzga/: ناو. پارێزگـە: ١. ویلایـەت؛ ئوسـتان؛ مەڵـبەندێکی گـەورەی دەوڵـەتی ٢. حەشارگەی ڕاوچی ☰ ١. اُستان ٢. کمین شکارچی

**پارێزگار**[١] / parêzgar/: ناو. ئوستاندار؛ لێپرسراوی کارگێڕی و بـاڵاترین پایـەی نـاو پارێزگایـەک ☰ اُستاندار

**پارێزگـار**[٢]: ئاوەڵـناو. ١. چـاودێر؛ هەڤـچاڤ ٢. پارێزکـار؛ دینـدار و لـەخواترس ☰ ١. مُراقـب ٢. پرهیزکار

**پارێزگـاری** / parêzgarî/: نـاو. ١. چـاودێرە؛ چاوەدێری ٢. پارێزکاری؛ پارسـایی ☰ ١. مراقبـت ٢. پارسایی

**پارێزگاریـەتی** / parêzgaryetî/: نـاو. سـەرنج؛ چاوەدێری؛ ئاگاداری ☰ توجه

**پارێزگە** / parêzge/: ☞ **پارێزگا**

**پارێزنـای** / parêznay/: چـاوگ. پاراسـتن؛ چاوەدێری کردن ☰ مُراقبت کردن

**پارێزنـەی** / parêzney/: چـاوگ. پاراسـتن ☰ پاسداری کردن

**پـارێزەر**[١] / parêzer/: ناو. ١. ئـەوەی کـەس یـان شتێک دەپارێزێ ٢. بریکار؛ ئاوقاتی؛ قانوون‌زانێک کە لە دادگـا لەسـەرکردنەوە و پاراسـتنی مـافی بەرتاوانی گرتۆتە ئەستۆ ☰ ١. مُحافظ ٢. وکیل

**پارێزەر**[٢]: ئاوەڵناو. پاڵپشت؛ پشتیوان ☰ پشتیبان

**پـارێزەک** / parêzek/: نـاو. شـوێنێکی بچـووکی دەورگیراو بۆ هەڵگرتن و پاراستنی شتومەک ☰ محفظه

**پارێزیـای** / parêzyay/: چـاوگ. پــارێزران؛ چاوەدێری لێ کران ☰ مراقبت شدن

**پارێزیـەی** / parêzyey/: چـاوگ. پـارێزران ☰ مُراقبت شدن

**پارێڤ** / parêv/: ناو. گۆشتی پیشاو لە تەنـدووردا ☰ گوشت در تنور پخته

**پارێن** / parên/: ☞ **پارگوێز**

**پارێنکە** / parênke/: ☞ **پاروێنکە**

**پارێنە** / parêne/: ☞ **پارگوێز**

**پاڕاشوت** / pařaşût/: ☞ **پاراشوت**

**پاڕاندن** / pařandin/: چاوگ. دەڵانـدن؛ پـاڵاوتن

≡ پالودن

**پاڕانەوە** / pařanewe/: چاوگ. تێنەپەڕ. //پاڕایەوە؛ دەپاڕێیەوە؛ بپاڕێوە// پاڕینەوە؛ لالانەوە؛ بە زەلیلی و زەبوونی داوا کردن ‹نزا و پاڕانەوە و گریان و ناڵە/ چ سوودێکی هەیە، نووشتەی بەتاڵە! «هێمن»› ≡ التماس کردن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: پاڕاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەپاڕانەوە

**پاڕکە** / pařke/: ناو. لەرە؛ لەرزە ≡ لرزش

**پاڕۆ** / pařo/: ناو. پاڕوو؛ پارێک؛ بێلی دارین ≡ پارو

**پاڕوو** / pařû/: ☜ **پاڕۆ**

**پاڕووکراو** / pařûk(i)raw/: ناوەڵناو. مالاو؛ ماڵراو ≡ روبیده

**پاڕە** / paře/: ناو. لالە؛ لاڤە؛ کڕووز ≡ لابە

**پاڕەش** / pařeş/: ناوەڵناو. [مەجاز] قۆشمە؛ شووم ≡ شوم

**پاڕەوکە** / pařewke/: ☜ **پێڕەوکە**

**پاڕیان** / pařyan/: چاوگ. پاڕانەوە؛ لالانەوە ≡ لابە کردن

**پاڕیانەوە** / pařyanewe/: چاوگ. پاڕینەوە؛ پاڕانەوە؛ لالانەوە ≡ التماس کردن

**پاڕیایۆ** / pařyayo/: چاوگ. پاڕانەوە ≡ التماس کردن

**پاڕینەوە** / pařînewe/: ☜ **پاڕانەوە**

**پاڕێرەوە** / pařêrewe/: ناوەڵناو. تکاکەر؛ شفاتکەر ≡ شفیع

**پاز**[1] / paz/: ☜ **پاس ـ١**

**پاز**[2]: ناوەڵناو. ناسک ≡ نازک

**پازار** / pazar/: ناو. ١. گرانیت؛ بەردێکە زۆر سەخت و بە زۆر ڕەنگان ٢. یەکشەممە؛ یەکشەمە؛ ڕۆژی دوای شەممە ‹ڕۆژی یەکشەممە کە مەشهوورە بە ڕۆژی پازار «شێخ ڕەزا»› ≡ ١. گرانیت ٢. یکشنبه

**پازازک** / pazazik/: ناو. پاسەوان؛ کێشکچی ≡ نگهبان

**پازدار** / pazdar/: ☜ **پاسدار**

**پازدە**[1] / pazde/: ناو. پانزە؛ دە و پێنج؛ ژمارەی سەرەکی دوای چواردە و پێش شازدە ≡ پانزده

**پازدە**[2]: ناوەڵناو. پانزە: ١. دانەیەک زیاتر لە چاردە ٢. پانزەمین؛ پانزدەهەم ≡ ١و٢. پانزده

**پازدەمین** / pazdemîn/: ☜ **پازدەهەمین**

**پازدەهەم** / pazdehem/: ناوەڵناو. پازدەیەم؛ پانزەهەم؛ پانزەیەم؛ پانزدەهەم؛ لە ڕیز، پێگە یان جێگەی پانزەدا ≡ پانزدهم

**پازدەهەمی** / pazdehemî/: جێناو. پازدەیەمی؛ ئەوەی لە ڕیز، پێگە یان جێگەی پانزەهەمدا بێ ≡ پانزدهمی

**پازدەهەمین** / pazdehemîn/: ناوەڵناو. پازدەمین؛ پانزەمین؛ پانزەهەمین؛ لە ڕیز، پێگە یان جێگەی پانزدەهەمیدا ≡ پانزدهمین

**پازدەیەم** / pazdeyem/: ☜ **پازدەهەم**

**پازدەیەمی** / pazdeyemî/: ☜ **پازدەهەمی**

**پازگا** / pazga/: ☜ **پاسگا**

**پازگر** / pazgir/: ☜ **پاسگر**

**پازل** / pazil/: ناوەڵناو. گاپا؛ لنگمەتک؛ گاپێ ≡ پاگُنده

**پازن** / pazin/: ناو. بزنەکێوی؛ بزنەکێفی؛ کەلەکێوی ≡ بُز کوهی

**پازناو** / paznaw/: ناو. پازناوک؛ کاری مەلغەی بەرداش هەڵێنان ≡ عمل برداشتن اهرم سنگ آسیا

**پازناوک** / paznawik/: ☜ **پازناو**

**پازەن** / pazen/: ناو. نێرییە کێوی ≡ بُز کوهی نر

**پازەناو** / pazenaw/: ناو. لەوازە؛ چێوی ڕێک و تەراز کردنی بەرداش ≡ چوبهای تراز کردن سنگ آسیا

**پاژ** ¹ / paj/: ناو. ١. پارچە؛ بەش ٢. بەڵگە؛ دەلیل ٣. ☜ **پێنج** ☰ ١. بخش ٢. سند؛ دلیل ٣. ☜ **پێنج**

**پاژ ـ**²: پێشوشە. پاش ـ ؛ پێوەندیدار یان سەر بە کات یان ڕووداوێکی پاشتر ‹پاژماڵە› ☰ پیشوند ارجاعی

**پاژبو** / pajbû/: ناوەڵناو. داوڕ؛ دادڕ؛ دابڕ ☰ جُدا شده

**پاژماڵە** / pajmałe/: ناو. ژێرماڵە؛ ماڵی خزمەتکار لە خانووی ئاغادا ☰ مسکن مستخدم در منزل ارباب

**پاژملە** / pajm(i)le/: ☜ **پاشملە**

**پاژن** / pajin/: ☜ **پێنجەم**

**پاژنو** / pajnû/: ☜ **پاژنە**

**پاژنە** / pajne/: ناو. پاژنوو: ١. پانیەی پا ٢. ڕێسمە؛ گرێژەنە ٣. تەختەی ژێرەوەی قۆناخی تفەنگ ٤. پانیەی کەوش؛ بەشی دواوەی کەوش ☰ ١. پاشنە ٢. پاشنەی در ٣. پاشنەی قُنداق ۴. پاشنەی کفش

▣ **پاژنە دەرگا**: بن ڕێسمانە؛ ڕێسمە؛ گرێپەنە؛ گێجەنە؛ ئەو قووڵکەی دارەی درگای لە سەر دەگەڕێ ☰ پاشنەی در

**پاژنە پڕ** / pajnepiř/: ناوەڵناو. قولاپە و پاژنە خڕین و قەڵەو ☰ دارای پاشنە و پشت پای فربە

**پاژنەکێش** / pajnekêş/: ☜ **پاژنەهەڵکێش**

**پاژنەهەڵکێش** / pajnehełkêş/: ناو. پاژنەکێش؛ پاشنیکەش؛ پانیەکێش؛ کەرتێکی لووسی پێڵە، بۆ دەپێ کردنی کەوشی تەنگ ☰ پاشنەکش

**پاژوخ** / pajux/: ناو. وەرام؛ پەرسف؛ جواب؛ جوال ☰ پاسخ

**پاژەر** / pajer/: ناو. ستوون؛ ئەستوون ☰ ستون

**پاژەرە** / pajere/: ناو. کۆڵەکە؛ ئەستوون ☰ ستون

**پاژەرژ** / pajerej/: ناو. چرۆی گەڵاگوێز ☰ جوانەی برگ گردو

**پاژی** / pajî/: ناوەڵناو. کەم؛ هندک ☰ جزئی

**پاژینە** / pajîne/: ناو. ١. کەپەکی ئارد ٢. بنژیلی گەنم ☰ ١. نُخالەی آرد ٢. تەماندەی غربال

**پاس** / pas/: ناو. ١. پاز؛ زێرەڤانی؛ ئاگاداری؛ ئێشک ‹بۆ پاسی ڕوو لە تووڕەیی موو، ماری ئەرقەمی/ چین ـ چین حەساری بەستووە هەر سوو، بە مەحکەمی «سالم»› ٢. پاساپۆرت؛ بوارنامە ٣. کاری خستنی تۆپ بۆ هاواڵ لە یاریدا ٤. ئوتووبووس؛ ماشێنی گەورەی گوازتنەوەی خەڵک ☰ ١. پاس؛ نگهبانی ٢. پاسپورت ٣. پاس؛ ارسال توپ ۴. اتوبوس

▣ **پاس کردن**: ١. کێشک گرتن ‹سەگان ئەڵێن: حەوحەوحەو/ نانمان بەنێ بژین بەو/ ئێمە پاستان ئەکەین شەو/ وەختێ چاوتان چووە خەو «بێکەس»› ٢. وەڕینی سەگ ☰ ١. پاسداری کردن ٢. پارس کردن سگ

**پاسا**¹ / pasa/: ناو. ١. چاوپۆشی ٢. سەرپۆش ٣. کاری پێ لە عەرز خستن؛ پا بە زەوینا ساوین ☰ ١. چشم‌پوشی ٢. سرپوش ٣. پا بر زمین کشیدن

▣ **پاسا دان**: ١. تۆژینەوە؛ لێ ورد بوونەوە ٢. پاکانە کردن ☰ ١. پژوهیدن ٢. توجیە کردن

**پاسا کردن**: پاکانە کردن ‹نازانم ئەو درۆیانە چۆن پاسا دەکەن؟!› ☰ توجیە کردن

**پاسا**²: ناوەڵناو. ١. وەشارتوو؛ بەرپیوار؛ نادیار ٢. داپۆشەر؛ گومکەر؛ وەشێر ☰ ١. پنهان ٢. پنهان‌کنندە

**پاساپۆرت** / pasaport/: ناو. پاس؛ پاسپۆرت؛ پەساپۆرت؛ بوارنامە؛ گوزەرنامە؛ بروانامەی فەرمی بۆ تێپەڕین لە سنوورەکانی دەوڵەتێکەوە ☰ پاسپورت

**پاسار** / pasar/: ناو. ١. پاسارە؛ سوانە؛ گوێسوانە؛ لێوارەی بان ٢. کاری پەند پێ دان و تەمێ کردن ٣. کەسەر؛ کوڵ؛ داخی دڵ ☰ ١. لبەی بام ٢.

تنبیه ٣. اندوه

⊡ **پاسار دان:** کوڵی دڵ دەرکردن ☲ دق‌دل خالی کردن

**پاسارو / pasaru/:** ناو. چۆلەکە؛ چویلەکە؛ مەلیچک ☲ گنجشک

**پاسارو / pasarû/:** ☜ **پاساری**[1]

**پاسارە / pasare/:** ناو. ☲ ☜ **پاسار-١**

**پاساری**[1] **/ pasarî/:** ناو. پاساروو؛ چڤیک؛ چیشکە؛ چۆلەکەی ئاوەدانی ☲ گُنجشک

**پاساری**[2]**:** ئاوەڵناو. پاساردار ‹کلاو پاساری› ☲ لبه‌دار

**پاساژ / pasaj/:** ناو. بینای گەورە کە هەموو ژوورەکانی دووکانە ☲ پاساژ

**پاساو / pasaw/:** ☜ **پاشاراو**

⊡ **پاساو دان:** هەوڵ دان بۆ شاردنەوەی تاوانی کەسێ ☲ سرپوش گذاشتن

**پاسپازۆک / paspazok/:** ناو. پەسپەسەکۆلە؛ هەلەپەزە؛ پس‌پسەکۆلە ☲ رُتیل

**پاسپۆرت / pasport/:** ☜ **پاساپۆرت**

**پاستا / pasta/:** ناو. ناوی گشتی بۆ هەموو بەرهەمەکانی هەویری لە ئاردی گەنم کە بە کولانێک دەبنە خۆراک (وەک: ماکارۆنی، لازانیا و ...) ☲ پاستا

**پاستاو / pastaw/:** ناو. ١. یەکەمین ئاو دێرانی کێڵگە ٢. قوڕی دروستکراو بۆ کوورەخانە ☲ ١. اولین آبیاری مزرعه ٢. گِل سرشته برای کوره‌ی آجرپزی

⊡ **پاستاو ڕاخستن:** ☜ **پەستاو ڕاخستن**

**پاسترمە / pastirme/:** ☜ **باسترمە**

**پاستورمە / pasturme/:** ☜ **باسترمە**

**پاستوریزە / pasturîze/:** ئاوەڵناو. تایبەتمەندی خۆراکێک کە هەموو باکتری و پیسی لێ سڕاوەتەوە ☲ پاستوریزه

**پاسخان / pasxan/:** ☜ **پەستو-٢**

**پاسدار / pasdar/:** ناو. پازدار؛ پاسەوان. هەروەها: **پاسداری** ☲ پاسدار

**پاسدەر / pasder/:** ناو. قەرەوڵ؛ ئێشکگر ☲ نگهبان

**پاسرگیاگ / pasirg(i)yag/:** ئاوەڵناو. هەوکردوو؛ داخ و سوور هەڵگەڕاو ☲ مُلتهب

**پاسرگیان / pasirg(i)yan/:** چاوگ. هەو کردن؛ داخ و سوور هەڵگەڕان ☲ مُلتهب شدن

**پاسفندە / pasfinde/:** ئاوەڵناو. گەندەڵ؛ ڕزیو ☲ پوسیده؛ فرسوده

**پاسقاڵی / pasqaḷî/:** ناو. گاڵتە؛ تیز؛ تانە؛ قەشمەری؛ تیتاڵی؛ کاری گاڵتە پێ کردن ☲ مسخره

**پاسکیل / paskîl/:** ناو. کەرماشێن؛ دووچەرخە ☲ دوچرخه

**پاسگا / pasga/:** ناو. پازگا؛ پاسگە؛ جێگەی ئێشک گرتن ☲ پاسگاه

**پاسگر / pasgir/:** ناو. پازگر؛ پاسەبان؛ پاسەوان؛ کێشکچی؛ جەزایرچی ☲ پاسدار

**پاسگری / pasg(i)rî/:** ☜ **پاسەوانی**

**پاسگە / pasge/:** ☜ **پاسگا**

**پاسوخ / pasux/:** ناو. پاژوخ؛ جواو؛ وەڵام؛ وەرام ☲ پاسخ

**پاسور / pasûr/:** ناو. جۆرێ یاری بە وەرەق ☲ پاسور

**پاسە**[1] **/ pase/:** ئاوەڵکار. ئاوا؛ ئاوها؛ ئاوەها ‹پاسە بەرنامان بە زەرب ساتۆر/ لەیلێ پەرێ قەیس بکێشۆ بە زۆر «خانای قوبادی»› ☲ چنان؛ آنچنان

**پاسە**[2]**:** جێناو. وەها؛ وەسا ‹ئیسە خاس پاسەن تۆ نەی سەردەمدا/ هەردوو چەنی هەم پێچ دەی وە هەمدا «مەولەوی»› ☲ چنان

**پاسەبان / paseban/:** ☜ **پاسگر**

**پاسەبانی / pasebanî/:** ناو. پاسەوانی: ١.

نیگابانی ‹شەو پاسەبانی یانەی لەیل مەکەرد/ ڕۆ چەنی شوان مەگێلا نە هەرد «سەیدی»› ٢. کاری پاسەبان ☰ ١و٢. نگهبانی

**پاسەقەت** / paseqet/: ئاوەڵناو. شەلە؛ شەل ☰ لنگ؛ شل

**پاسەنگ** / paseng/: ☜ **پارسەنگ**

**پاسەنە** / pasene/: ئاوەڵکار. بەڵێ ☰ بلی

**پاسەوان** / pasewan/: ☜ **پاسگر**

**پاسەوانی** / pasewanî/: ☜ **پاسەبانی**

**پاسین** / pasîn/: ☜ **پەسن**

**پاش**[1] / paş/: ناو. ١. دواوە؛ پشت ‹ئەچمە پێش مردنم بەشە/ پاشم عارەبی ڕوورەشە «هەژار، بۆ *کوردستان*»› ٢. *[کینایە]* قنگ؛ قوون ٣. دووگی مەڕ؛ دووی پەز ☰ ١. عقب؛ پس ٢. باسن ٣. دُمبەی گوسفند

**پاش**[2]: ئامراز. لە پاش؛ پاشی ‹پاش چاکوچۆنی هەستاین؛ پاش زستان، بەهارە› ☰ بە دنبالِ؛ در پیِ

**پاش ـ**[3]: پێشوشە. ١. پێوەندیدار یان سەر بە پاشەوە ‹پاشڕۆ؛ پاشماوە؛ پاشبارە› ٢. یارمەتیدەر ‹پاشمامان؛ پاشدز› ☰ ١. پس ٢. کُمک

**ـ پاش**[4]: پاشەوشە. ـ پژێن؛ ـ پرژێن؛ ـ ڕشێن ‹ئاوپاش؛ شەکرپاش› ☰ ـ پاش

**پاش ـ**[5]: پێشگر. ١. نیشانەی بزووتن بەرەو پاش ‹پاشکەوتن› ٢. لەگەڵ برێ چاوگدا، چاوگێکی لێکدراوی نوێ دروست دەکا ‹پاشخستن› ☰ ١. پس ـ ٢. مصدر مرکب می‌سازد

⊡ **پاش خستن**: ١. گوێ نەدان؛ خۆ لێ گێل کردن ٢. وە درەنگ خستن؛ خستنە دواوە ☰ ١. اهمال کردن ٢. عقب انداختن

**پاش کەوتن**: لە دوا مان؛ بەجێمان ☰ وامانـدن؛ عقب افتادن

**پاشا** / paşa/: ناو. ١. مەزنی ئێران ‹با بڕووخێ کۆشکی پاشا/ هەنگاو بنێن بە سەر لاشا «هەژار، بۆ *کوردستان*»› ٢. لەقەمێکی تورکی بۆ پیاوە گەورەکانیان ‹مەحموود پاشا› ☰ ١. پادشاه ٢. پاشا؛ لقب اُمرای تُرک

**پاشاپاشایێن** / paşapaşayên/: ناو. میرمیرێن؛ گاڵتەیەکی بە کۆمەڵە ☰ از سرگرمی‌های گروهی

**پاشاخوڕ** / paşaxur̂/: ناو. بەرماوی ئاژەڵ لە قەسەڵ و ئالف ‹پاشاخوڕی گا، بۆ کەران باشە «مەسەل»› ☰ پسماندەی علف در آخور

**پاشاخۆر** / paşaxor/: ☜ **پەساخوڕ**

**پاشاخۆڕ** / paşaxor̂/: ☜ **پەساخوڕ**

**پاشاراو** / paşaraw/: ناو. پاساو؛ پەساو؛ ئاراو؛ پاشەراو؛ کەفاوی جارێک جل تێدا شۆراو ☰ پساب رختشویی

**پاشارۆ** / paşaro/: ناو. پاشەڕۆک؛ میوەی پاش ڕنین بە لکوپۆپی دارەوە بەجێماو ☰ پساچین

**پاشاگەرانی** / paşageranî/: ناو. شاگەردانی؛ دنیای بێ‌قانوون و پڕ لە ئاژاوە ☰ آشوب و بلوا

**پاشاگەردانی** / paşagerdanî/: ناو. *[مەجاز]* تێکەڵ ـ پێکەڵی و هەرکەس‌ـهەرکەس ☰ هرج‌ومرج

**پاشام** / paşam/: ناو. پارشێو؛ دواشێوی ڕۆژووگر ☰ سحری

**پاشامیری** / paşamîrî/: ناو. شێوازێکی دەسەڵاتدارییە کە شا یان شاژن دەسەڵاتی یەکەمی وڵاتن ☰ سلطنت

**پاشان** / paşan/: ئاوەڵکار. لەوە بەدوا؛ دوایی ‹چاکەی هەڵقوڕاند و پاشان جگەرەیەکی داگرساند› ☰ سپس

**پاشاو** / paşaw/: ناو. ١. پەساو؛ خەساراو؛ قنگاو ٢. چڵکاو؛ خەساراو ☰ ١. آب مازاد آبیاری ٢. چرکاب

**پاشاوخۆر** / paşawxor/: ناو. *[بلار]* قوونێر؛ چەورە؛ لامڕ ☰ انگل

**پاشای** / paşay/: چاوگ. شاناى؛ پاشین ☰ پاشیدن

**پاشایەتی**[1] / paşayetî/: ناو. ١. لە پلەی پاشادا بوون ٢. [کینایە] کەیفسازی و تەیاری ☰ ١. پادشاهی ٢. خوشگذرانی

**پاشایەتی**[2]: ناوەڵناو. بە شێوازی پاشامیری ☰ سلطنتی

**پاشایی** / paşayî/: ناو. ١. پاشایەتی ٢. جۆرێ ترێ ☰ ١. پادشاهی ٢. نوعی انگور

⊡ **پاشایی کردن**: ١. خوونکاری کردن ٢. [کینایە] خۆش ڕابواردن و ژیانی بە تێر و تەسەلی بردنە سەر ☰ ١. پادشاهی کردن ٢. خوش گذراندن

**پاشبارە** / paşbare/: ناو. دەستەندوو؛ دەسەکەوشە؛ جێ دەسگرەی جووتێر لە ئاموور ‹نە دەستی، پاشبارەی ناسی/ نە ساوێکی دا لە داسی «هێمن»› ☰ دستگیرەی خیش

**پاشبانگ** / paşbang/: ناو. دەنگی کەو لە پاش ماندوو بوونی لە خوێندن ☰ نوای کبکِ خستە از خواندن

**پاشبەر** / paşber/: ناو. دوامنداڵ ☰ آخرین فرزند

**پاشبەن** / paşben/: ناو. پاشبەند؛ پێوەندی پاشووی یەکسم ☰ پابند ستور

**پاشبەند** / paşbend/: ☜ **پاشبەن**

**پاشپارێژ** / paşparêj/: ☜ **پاشدار**

**پاشتر** / paştir/: ناوەڵکار. داهی؛ دوایی؛ دواتر؛ ئەوجار ☰ سپس؛ آنگاه

**پاشتن** / paştin/: چاوگ. لوول دان و گرێ دان و هەڵبەستنی وەک ڕیشوەی شەدە و مێزەر ☰ آویز بستن دستار

**پاشتەرک** / paşterk/: ناو. بەشی لای کلک لە کورتان و زیندا ☰ جای خُرج در زین

**پاشتەرکی** / paşterkî/: ناو. باری پاشتەرک ☰ بار دنبالەی زین

**پاشخان** / paşxan/: ناو. پەستوو؛ وچخانە؛ خەڵوەتی؛ ژووری کەلوپەل لە پشت ژووری دانیشتن ☰ پَستو

**پاشخراو** / paşx(i)raw/: ☜ **پاشەکەوت**

**پاشخوان** / paşx(i)wan/: ناو. پاشخوانە؛ بەرماو ‹بەشی خەوتوو، پاشخوانە› ☰ ماندەی خوراک

**پاشخوانخۆر** / paşx(i)wanxor/: ناو. بەرماوەخۆر ☰ پسماندەخور

**پاشخوانە** / paşx(i)wane/: ☜ **پاشخوان**

**پاشدار** / paşdar/: ناو. پاشپارێژ؛ پاشڕۆ؛ پاشەنگ؛ کەس یان کەسانێ کە لە دوای لەشکرەوە دەڕۆن ☰ پس‌قراول؛ دنبالەرو لشکر

**پاشدڕ** / paşdiř/: ناوەڵناو. ١. لە دواوەوە و بێدەنگ گازگر (زۆرتر بۆ سەگ دەگوترێ) ٢. [مەجاز] تایبەتمەندی مرۆڤێ کە بە نهێنی زەرەر و زیان دەدا ☰ ١. ویژگی سگی کە از پشت حملە می‌کند ٢. ویژگی کسی کە در خفا ضربە می‌زند

**پاشدز** / paşdiz/: ناو. پاشدزە؛ پاشەدزە؛ پاشکەوان؛ دزێ کە پاسی دزان دەدێرێ ☰ دزدِ نگهبان

**پاشدزە** / paşd(i)ze/: ☜ **پاشدز**

**پاشدوو** / paşdû/: ناو. قسەی پشتەملە ☰ غیبت

**پاشڕۆ** / paşřo/: ☜ **پاشدار**

**پاشقل** / paşqil/: ناو. گردەوەکۆیی؛ پاشەکەوت؛ پاشقول؛ کاری لە دەم گێڕانەوە؛ لە شتێ، شتێ وەلا نان ☰ صرفەجویی

⊡ **پاشقل دان**: گێڕانەوە؛ گل دانەوە. هەروەها: **پاشقل کردن** ☰ اندوختن

**پاشقول** / paşqul/: ناو. ١. پاچەقول؛ پاچەقولێ؛ پانجەقولێ؛ پێ لە پێ پێچان لە زۆراندا ٢. پاشقل؛ پاشەکەوت ٣. ئاخرین دراوێ کە بە قوماربازەوە دەمێنێت ☰ ١. لِنگ در کشتی ٢. پس‌انداز ٣. آخرین دینار قمارباز

⊡ **پاشقول لێدان**: پانجه‌قولێ دان؛ به کار هێنـانی فه‌نی پاشقول له زۆراندا 🇮🇷 لِنگ کردن در کشتی

**پاشقه‌ره‌وڵ** / paşqerewil/: ☜ **پەسقەرەوڵ**

**پاشکرا** / paşk(i)ra/: ئاوەڵناو. ڕه‌وا؛ ڕێ پێ دراو 🇮🇷 جایز

**پاشکۆ** / paşko/: نـاو. ١. هه‌گبـه‌؛ خـورجێکی پچـووک لـه دوای زیـن کـه لـه سـه‌ر تـه‌رکی داده‌به‌ستن ٢. یاداشتێ که له کۆتایی کتێب یان وتارێکه‌وه بۆ پاراو کردنی ده‌نووسـرێ ٣. شـتێک به پێکهاته و کارکردی سـه‌ربه‌خۆوه کـه هـاوڕێ ده‌گه‌ڵ شتێکی تـر و زۆر جـار وه‌ک ته‌واوکـه‌ری ئه‌و شته‌یه ٤. وڵاتی بێ‌خاوه‌ن که ده‌خرێته سه‌ر خاکی وڵاتێکی‌تر 🇮🇷 ١. خُرج کوچکی که بـر تـرک زین بندند ٢. پیوست کتـاب یـا مقالـه ٣. ضـمیمه ۴. سرزمین الحاقی

**پاشکۆم** / paşkom/: ☜ **پاشکەمە**

**پاشکۆمه** / paşkome/: ☜ **پاشکەمە**

**پاشکه‌ڵ** / paşkel/: ناو. کاری دیاری کردنی به‌رخ و کاژێلـه بـه بـڕینی لای دواوه‌ی گوێچکـه‌ی 🇮🇷 نشانه کردن گوش برّه و بُزغاله

**پاشکه‌مه** / paşkeme/: نـاو. پاشـکۆمه؛ پاشـکۆم؛ خواره‌وه‌ی قه‌فی گۆچان 🇮🇷 پایین خم عصا

**پاشکه‌وان** / paşkewan/: نـاو. ١. ☜ **پاشـدز** ٢. پاشماشه؛ فیشه‌کـفڕێده‌ری تفـه‌نگ 🇮🇷 ١. ☜ **پاشدز** ٢. فشنگ‌انداز تفنگ

**پاشـکه‌وتو** / paşkewtû/: ئاوەڵـناو. پاشـکه‌وته؛ به‌جێ‌ماو ‹تۆ نه‌ڵێی پاشکه‌وتووی، ئـه‌ی کورده‌کـه‌ی ناکامیاب!/ قه‌ت به سووکی تێ‌نه‌فکرێ، مـاڵوێرانـه‌ی دڵ‌خراپ «قانع»›. به‌رانبه‌ر: **پێشکه‌وتـوو** 🇮🇷 وامانده؛ جامانده

**پاشکه‌وته** / paşkewte/: ☜ **پاشکەوتو**

**پاشکی** / paşkî/: ئاوەڵکار. ده‌رئه‌نجام؛ له پاشان 🇮🇷 بعداً

**پاشـگر**[١] / paşgir/: نـاو. *[ڕێزمـان]* گرێـک کـه ده‌که‌وێته پاش وشه‌وه و مانـای ده‌گـۆڕێ (وه‌ک: «مه‌ند» له «ئاره‌زوومه‌ند»دا) 🇮🇷 پسوند

**پاشگر**[٢]: ئاوەڵناو. له دواوه و کوت‌وپڕ گـازگر (زۆرتـر بۆ گه‌ماڵ ده‌گوترێ) 🇮🇷 ویژگـی سـگی کـه از پشـت حمله می‌کند

**پاشگۆ** / paşgo/: ناو. پاشدوو؛ قسه‌ی پشـته‌مل 🇮🇷 غیبت

**پاشگه‌ز** / paşgez/: ئاوەڵـناو. په‌شیمان؛ پێژه‌وان 🇮🇷 پشیمان

⊡ **پاشگه‌ز بوونه‌وه**: په‌شیمان بوونـه‌وه. هـه‌روه‌ها: **پاشگه‌ز کردنه‌وه** 🇮🇷 پشیمان شدن

**پاشل** / paşil/: ناو. پاشڵ؛ باخه‌ل؛ به‌خه‌ڵ؛ ئامێز 🇮🇷 بغل؛ آغوش

**پاشڵ** / paşił/: نـاو. پاشۆڵ: ١. به‌شی خوار که‌مه‌ر له پشـته‌وه ‹هـه‌ر بینـا شۆڕشـه‌که‌ت هاتـه‌وه گـه‌ڕ/ سـه‌رنه‌وی بـوو عه‌جـه‌می پاشـڵ تـه‌ڕ «هـه‌ژار، *بـۆ کوردستان*»› ٢. پاشل؛ باخه‌ڵ؛ ئامێز ٣. پشته‌وه‌ی ڕان ٤. پاڵووی بـه زه‌نگۆڵـه ٥. سـه‌روا؛ قافیـه‌ی شیعر 🇮🇷 ١. پایین‌تنه از پشت ٢. بغل ٣. پشتِ ران ۴. پالدُم زنگوله‌دار ۵. قافیه

**پاشڵدار** / paişłdar/: ئاوەڵناو. به‌کلکه؛ کلکـدار؛ بـه دوایی 🇮🇷 دُنباله‌دار

**پاشـڵزه‌لام** / paşiłzelam/: ئاوەڵـناو. ده‌پـه‌قوون؛ قنگ‌پان 🇮🇷 باسن‌گُنده

**پاشـمار** / paşmar/: نـاو. شـکایه‌تلـێکـراو 🇮🇷 مُتشاکی

**پاشماره** / paşmare/: ناو. پاشماڵه؛ ژێرماڵه؛ ماڵێ که خزمه‌تی ماڵه‌گه‌وره ده‌که‌ن و له‌وێش ماڵـیان پێ دراوه 🇮🇷 خانواده‌ای که به خدمتکاری در خانـه‌ای ساکنند

**پاشماشه** / paşmaşe/: نـاو. پاشـکه‌وان؛ فیشـه‌ک فڕێده‌ره‌وه 🇮🇷 فشنگ انداز تفنگ

**پاشماک** / paşmak/: ☜ **پاشماگە**

**پاشماگ** / paşmag/: ☜ **پاشماگە**

**پاشماگە** / paşmage/: ناو. پاشماک؛ پاشماگ؛ کەلەپوور؛ میرات ☰ میراث

**پاشماڵە** / paşmałe/: ناو. ١. ئەو ماڵەی لەگەڵ خێڵ بۆ هەوار دەچن و لە بەر نەداری خزمەتی خێڵ دەکەن ٢. ☜ **پاشمارە** ☰ ١. خانەای کە بە خدمتکاری با ایل بە ییلاق روند ٢. ☜ **پاشمارە**

**پاشمامان** / paşmaman/: ناو. ژنێ کە لە منداڵ هێناندا یاریدەی مامان دەدا ☰ دستیار ماما

**پاشماوە** / paşmawe/: ناو. ١. باقی؛ بەرماو؛ ئەوی لە بەر مابێتەوە ٢. زیندووی کەس و کاری مردوو ☰ ١. باقیماندە ٢. بازماندە

**پاشـــــماوەخۆر** / paşmawexor/: ناو‌ەڵـــــناو. پاشەرۆکخۆر: ١. بەرماوخۆر؛ چڵکاوخۆر ٢. /کینایە/ نۆکەر ☰ ١. ریزەخوار ٢. نوکر

**پاشمله** / paşmile/: ناو. پاژمله؛ پاشگۆ؛ پاشەمله؛ پاشدوو؛ لەمەت؛ گالەگورت؛ خوسپ؛ خراپەبێژی ئەم و ئەو لە نەبوونیاندا. هەروەها: **پاشملە گوتن** ☰ غیبت

**پاشملەبێژ** / paşm(i)lebêj/: ناوەڵناو. کابگر ☰ غیبت‌گوی

**پاشمەرگە** / paşmerge/: ناو. منداڵێ کە پاش مەرگی باوک بێتە دنیاوە ☰ بچەای کە بعد از مرگ پدر بە دنیا آید

**پاش‌مەلا** / paşmela/: ناو. پاشمەڵڵا؛ دوابـاش؛ دووباش؛ دووهەمین کەس لە هێندێک کایەی وەک مێشێندا ☰ دوم بازیکن در بعضی از بازی‌ها

**پاشمەڵا** / paşmełła/: ☜ **پاش‌مەلا**

**پاشمەندە** / paşmende/: ☜ **پاشمەنە**

**پاشمەنە** / paşmene/: ناو. باقی‌ماو؛ پاشمەندە ☰ باقیمانده

**پاشمێر** / paşmêr/: ناو. ١. پشتگر لە شەڕ و کێشەدا ٢. بەرگری دواوە لە تۆپی‌پێدا ☰ ١. کسی کە در جنگ بە دیگری کمک می‌کند ٢. دفاع عقب در فوتبال

**پاشن** / paşin/: ناوەڵناو. دوایین؛ دوایی؛ پاشین؛ دومایی؛ دمایی؛ ئاخری؛ دوماهی ☰ پسین

**پـــــاش‌نوێخوازی** / paşn(i)wêx(i)wazî/: ☜ **پۆست مودێرنیزم**

**پاشنوێژ** / paşn(i)wêj/: ناو. /کینایە/ پاش‌نیوەڕۆ؛ دوای‌نیمەڕۆ ☰ بعدازظهر

**پاشنی** / paşnî/: ناو. پاژنە؛ پانیە ☰ پاشنه

**پاشنیکەش** / paşnîkeş/: ☜ **پاژنەهەڵکێش**

**پاش‌نیوەڕۆ** / paşnîweřo/: ☜ **پاشنوێژ**

**پاش‌وپێش**[1] / paş û pêş/: ناو. بەروپشت ‹ڕووەو بەیتی خودا خاڵت ئەڵێ دائیم لە سەر بەرماڵ/ لە وەختی پاش‌وپێشی نوێژی ئێوارە و سبەینانی «بێخود»›

**پاش‌وپێش**[2]: ناوەڵناو. بەر و دوا؛ قەر و دما ‹ئەو چەند ژمارە پاش‌وپێشن›. هەروەها: **پاش‌وپێش بوون؛ پاش‌وپێش کردن؛ پاش‌وپێش کەوتن** ☰ پس و پیش

**پاش‌وپێش**[3]: ناوەڵکار. بەر و دوا؛ قەر و دما ‹ژمارەکان پاش‌وپێش دەنووسێ› ☰ **پس و پیش**

**پاشوەچە** / paşweçe/: ناو. نەوە و نەوی چرک ☰ نبیرگان

**پاشوەن** / paşwen/: ناو. پاشبەند ☰ پابند حیوان

**پاشۆر** / paşor/: ناو. ١. ☜ **پاشۆره** ٢. بەردی پێ خاوێن کردنەوە ٣. شوێنێ لە قەراخی حەوز بۆ دەسنوێژ گرتن و پا شۆردن ☰ ١. ☜ **پاشۆره** ٢. سنگپا ٣. پاشوره

**پاشۆره** / paşore/: ناو. پاشۆر؛ ئاوی (زۆرتر سارد) بۆ شۆردنی پەل‌وپای نەخۆش ☰ پاشویه

⊡ **پاشۆره کردن**: پەل‌وپا شۆردن بۆ فێنک کردنەوەی تادار ☰ پاشویه کردن

**پاشۆڵ** / paşoł/: ☜ **پاشڵ**

**پاشو** / paşû/: ناو. پاشی؛ دوو پەلی دواوەی یەکسم ‹پاشوو دیبەک، چاوتەنوور و گوێ وەکوو گوێدرێژی پیر/ کەللە دێو و بێ‌دیان و سینە وەک دەربەی شکاو «قانع»› ☰ هر دو پای ستور

⊡ **نیشتنە سەر پاشو:** هەستانەوە لە سەر دوو پەلی دواوە (یەکسم) ☰ سرِ پا ایستادن ستوور

**پاشە ـ** / paşe-/: پێشوشە. پاش؛ دوا ‹پاشەکەوت؛ پاشەدزە› ☰ پسا ـ

**پاشەبەر** / paşeber/: ناو. پاشەرۆک ☰ پساچین

**پاشەبەرە** / paşebere/: ناو. ۱. پاشەرۆک ۲. دوامین فرزەند ☰ ۱. پساچین ۲. آخرین فرزند

**پاشەچن** / paşeçin/: ناو. پاشەرۆک؛ پاشارۆ ☰ پساچین

**پاشەخورج** / paşexurc/: ناو. هەگبە؛ پاشتەرکی ☰ خُرج اسب

**پاشەدزە** / paşed(i)ze/: ☜ **پاشدز**

**پاشەراو** / paşeraw/: ☜ **پاشاراو**

**پاشەرۆک** / paşerok/: ناو. ۱. پاشارۆ؛ شارۆ؛ پاشەبەر؛ پاشەبەرە؛ قورف؛ خاپەرۆک؛ خرتک؛ پاشەچن؛ پاشەڕن؛ دومارن؛ دومارنگ؛ دوویارنگ؛ بەر یان میوەی بەجێماو لە دار کە لە بەر کاڵی و نادیاری نەچنرابێ ۲. پاشماوە ☰ ۱. پساچین ۲. پسماندە

⊡ **پاشەرۆک کردن:** میوەی بەجێماو لە دار چنینەوە ‹پاشەرۆکێکی بکەم لەم باخە/ تاکوو باڵ و پەڕی من پەرداخە «سوارە»› ☰ پساچین کردن

**پاشەرۆکخۆر** / paşerokxor/: ☜ **پاشماوەخۆر**

**پاشەڕن** / paşeřin/: ناو. شارۆ؛ پاشەرۆک؛ پاشارۆ ☰ پساچین

**پاشەڕۆژ** / paşeřoj/: ناو. داهاتوو؛ لەوەدوا ‹خشڵ و جوانی تۆ حەیا و فێر بوونە/ پاشەڕۆژیشت هەر بەوان ڕوونە «بێکەس»› ☰ آیندە

**پاشەسەر** / paşeser/: ناو. پشتەسەرە؛ جۆرێ خشڵی ژنانە کە لە دواوەی لارەپێچی دەدەن ☰ نوعی زیور زنانە

**پاشەکشە** / paşek(i)şe/: ناو. پاشەکشێ: ۱. کار و ڕەوتی هاتنە دواوە لە شەڕدا ‹بە پێشمەرگە دەستوور درا بێ دەستکردنەوە، پاشەکشە بکا «هێمن»› ۲. *[کینایە]* پەشیمانی ☰ ۱. عقب‌نشینی ۲. پشیمانی

⊡ **پاشەکشە کردن:** ۱. بەرەودوا کشانەوە ۲. *[کینایە]* پەشیمان بوونەوە ☰ ۱. عقب‌نشینی کردن ۲. پشیمان شدن

**پاشەکشێ** / paşek(i)şê/: ☜ **پاشەکشە**

**پاشەکەفت** / paşekeft/: ☜ **پاشەکەوت**

**پاشەکەوت** / paşekewt/: ناو. پاشەکەفت؛ پاشەکەوتی؛ پاشەناز؛ پاش‌خراو؛ گڵ‌دراوە ‹پاشەکەوتی جۆ بە کەم مەژمێرە/ خواردنی چوارپا و دووپێیە لێرە «پیرەمێرد»› ☰ پس‌انداز

⊡ **پاشەکەوت کردن:** خستنە لاوە ‹پاشەکەوت کردن لە دنیا بۆ هەموو کەس لازمە/ پەندی بێکەس بگرە تاکوو تووش نەبی بەو حاڵەتە «بێکەس»› ☰ پس‌انداز کردن

**پاشەکەوتی** / paşekewtî/: ☜ **پاشەکەوت**

**پاشەکی** / paşekî/: ناو. ئەو بەشە لە پارە کە پاش وەرگرتنی کاڵا بە فرۆشیار دەدرێت ☰ پسادست

**پاشەلەقە** / paşeleqe/: ئاوەڵکار. شلەشل؛ بە تەنبەڵی (لە ڕۆیشتن) ☰ سلانە ـ سلانە

**پاشەڵ** / paşeł/: ناو. ۱. جلی سەر پاشڵ؛ بەرگی پاشل؛ دواوەی داوێن ۲. کار و ڕەوتی دانی پارە، پاش وەرگرتنی کاڵا ۳. *[مەجاز]* پێشینە؛ ڕابردە ٤. لای پاشەوە. بەرانبەر: **پێشەڵ** ☰ ۱. قسمت عقبی دامن ۲. پسادست ۳. سابقە ۴. خلفی

**پاشەڵپیس** / paşełpîs/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* شوێن‌چەپەڵ؛ خاوەن ڕابردووی خراپ ☰ بدسابقە

**پاشەملە** / paşem(i)le/: ☜ **پاشملە**

**پاشەناز** / paşenaz/: ☜ **پاشەکەوت**

**پاشـەنگ** / paşeng/: نـاو. پاشـــدار؛ پاشـــڕۆ ☰ پس‌قراول

**پاشـەوار** / paşewar/: نـاو. ئاســەوار؛ بەرهــەمی بەجێ‌ماو ☰ آثار گذشتگان

**پاشـەوانە** / paşewane/: نـاو. ســندووقێ لــە پلـوورەی هـەنگا بـۆ شـانە تێـدا هەڵبەسـتن ☰ جعبەی چوبین برای شانەگذاری زنبور

**پاشـەوپاش**[1] / paşewpaş/: ئاوەڵـناو. پشـــتەوڕوو؛ پێچەوانە ☰ وارونە؛ پشت‌ورو

**پاشەوپاش**[2]: ئاوەڵکار. پشتەوپشـت ‹ئیتـر نامـەردە پاشەوپاش کشاوە/ لە خۆشیان ڕەنگ و ڕووی مـیری گەشاوە «هێمن»› ☰ عقب ـ عقب

**پاشـەوە**[1] / paşewe/: ئاوەڵـناو. لـە پـاش کـەوتوو ‹ددانی پاشەوە؛ درگای پاشەوە› ☰ عقبی؛ پُشتی

**پاشەوە**[2]: ئاوەڵکار. بەرەوپاش؛ بـۆ پـاش؛ لـە پـاش ‹پاشەوە چوون› ☰ به عقب

**پاشەوەی**[1] / paşewey/: ئاوەڵـکار. پاشان ‹پاشەوەی هەستا و دەستی ماچ کرد› ☰ سپس

**پاشەوەی**[2]: ئامراز. لە پاشیِ؛ لە پاشەوەی ‹پاشەوەی ئەوان دانیشت› ☰ پُشتِ سرِ

**پاشی**[1] / paşî/: ☜ **پاشو**

**پاشی**[2]: ئاوەڵکار. دواتر؛ پاشـان ‹پاشـی هەسـتاین و دەستمان گرت› ☰ سپس

**پاشی**[3]: ئامراز. لە پاش؛ لە دوای ‹پاشی بالاکەت دڵ بە کێ خۆش کەم› ☰ پس از

**. پاشی**[4]: پاشەوشە. کاری پاشین ‹نمـەکپاشـی› ☰ ـ پاشی

**پاشین**[1] / paşîn/: چاوگ. پژاندن ☰ پاشیدن

**پاشین**[2]: ئاوەڵـناو. هـەرەدوا ‹کـە دیکتـاتۆریی شـای پاشـین دەس‌پێکـرا، ئـەو دەنگـی کـوردەش داخـرا. «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ واپسین

**پاشین**[3]: جێناو. ئەوی لە پاشـەوە ‹پاشـین هەسـتا و وتی من ئامادەم› ☰ عقبی

**پاشینە** / paşîne/: ناو. شەممە؛ شەممۆ ☰ شنبه

**پاشێل** / paşêl/: ئاوەڵناو. پاکوت؛ پاکوتە؛ پێ‌شـێل؛ تەپس؛ پێخوس؛ پێخوست؛ لەقەشێل؛ پێهن‌مـاڵ؛ لەقەماڵ؛ تلیساو؛ پاخوەشە؛ پـاکۆ؛ پـاولا؛ پامـاڵ؛ پاتلن؛ سمکوو: ١. لە ژێر پێدا پلیشاو و لە کەڵک کـەوتوو ٢. *کینایە*/ تـەرت‌وتوونـا؛ تـەفروتوونا ‹ڕەحمـت بـۆ! وادەی وەسـتەی بارەکـەت/ نـەبۆ وە پاشێل پای قەتارەکەت «مەولـەوی»› ☰ ١. لگدمال ٢. پایمال

⊡ **پاشێل کردن**: بـەرپێ دان؛ پـێ‌خوسـت کـردن ‹تـەواو گەنمەکـەیان پاشـێل کـرد›. هـەروەها: **پاشێل بوون** ☰ لگدمال کردن

**پاشێڵ** / paşêl/: ناو. ١. سەرواْ؛ پاشڵ ٢. بەلـەکی پێ ☰ ١. قافیه ٢. ساق پا

**پاشێو** / paşêw/: ناو. پارشێو ☰ سحری

**پاق** / paq/: ناو. لینگ؛ لاق؛ قاچ ☰ لِنگ

**پاقـاوێژ** / paqawêj/: ئاوەڵناو. حاڵی ئەوەی کە لە ڕۆیشتندا قاپ لە قاپ دەدا ☰ ویژگی کسی که در راه رفتن قوزک‌هایش به هم می‌خورند

**پاقر** / paqir/: نـاو. پاخر؛ باقر: ١. مس ٢. ژەنگی مس ☰ ١. مس ٢. زنگار مس

**پـاقژ** / paqij/: ئاوەڵـناو. پـاک؛ پـاکژ؛ خـاوێن؛ تەمیس ☰ پاکیزه

**پـاقژە** / paq(i)je/: نـاو. پەلـەقاژە؛ کـاری لـە تـاو شتێ یـان بـۆ دەربـاز بـوون، بـە دەسـت و پـێ تێکۆشان ☰ عمل دست و پا زدن

**پاقژی** / paq(i)jî/: ☜ **پاکژی**

**پاقل** / paqil/: ناو. پووز؛ بەلەک ☰ ساق پا

**پاقلانجقی** / paqlanc(i)qî/: ☜ **پاقلانجی**

**پاقلانچکە** / paqlanç(i)ke/: ناو. گیایەکی ڕەوانـە بە گـەڵای ددانـەدارەوە ☰ گیـاهی بـا بـرگ‌هـای

کنگرەای

**پاقلاوه** / paqlawe/: ناو. باقلاوا؛ شیرنییەکی بەناوبانگە ☰ باقلوا

**پاقلۆک** / paqlok/: ناو. ئێسکی قەڵەمە ☰ قلم دست و پا

**پاقله** / paqle/: ناو. باقله؛ دانەوێڵەیەکە دە کلوودا پەروەردە دەبێ ☰ باقالی

**پاقلەکێوی** / paqlekêwî/: ناو. پۆلکە؛ کەلوو ☰ باقالای کوهی

**پاقلەمارانە** / paqlemarane/: ناو. پاقلەکێوی؛ پۆلکەمارانە ☰ باقالی کوهی

**پاقلیر** / paqlîr/: ناوەڵناو. پاکلیر: ۱. پاککراو ‹گوێزی پاقلیر› ۲. پاخلێر؛ داتاشراوی ساف و لووس ‹سەری پاقلیر› ☰ ۱. پوست‌کنده ۲. از بیخ تراشیده و صاف شده

⊡ **پاقلیر کردن**: ۱. گوێز پاک کردن ۲. تاشین و تووک و مووی شتێ لابردن و لووس کردنی ☰ ۱. گردو پوست کندن ۲. تراشیدن و صاف کردن

**پاقلینچکانە** / paqlînçkane/: ناو. گیایەکە لە پرپرە دەکا ☰ گیاهی شبیه خرفه

**پاقلێس** / paqlês/: ناو. کاری پاقژ کردن؛ کاری لێستنەوەی دەفری خۆراک پاش تەواو بوونی خۆراک ☰ عمل لیسیدن

**پاقڵانجی** / paqłancî/: ناو. پاقڵەجقی؛ پاقلانجقی؛ پاقڵەجقی؛ پەقلانجقە؛ پاقلانچکە؛ پاقڵەجقی؛ خۆڵوشیر؛ خاکشیر ☰ خاکشیر

**پاقڵه** / paqłe/: ☜ باقله

**پاقڵەجقی** / paq(i)łec(i)qî/: ☜ پاقلانجی

**پاقوڵاخ** / paqułax/: ناو. سمکۆڵ ☰ عمل سُم بر زمین کوبیدن

**پاقوڵاغ** / paqułağ/: ناو. سمی حەیوانی دوو سم ☰ سُم حیوان جُفت‌سُم

**پاک**[1] / pak/: ناوەڵناو. ۱. خاوێن؛ بێ‌خەوش؛ پوختە؛ پاکژ؛ پاقژ؛ پوار؛ پا؛ هیلاو؛ بژوون؛ ئاسووار؛ تەمیس ‹شیری پاکی ئەنایە دەم/ گەشەی پێ ئەکرد ژەمبەژەم «گۆران»› ۲. باش؛ پەسند ‹چەند چەوسامەوە لە ڕێگەی کاکم/ دنیا شایەتە چەند پاک و چاکم «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ ۱. پاکیزه ۲. پسندیده

⊡ **پاک بوونەوە** پا بوونەوە: ۱. خاوێن بوونەوە؛ پیسی و پۆخڵی پێوە نەمان ‹چەندی دەیشۆم پاک نابێتەوە› ۲. *[مەجاز]* لە ناو چوون؛ نەمان ۳. *[پلار]* مردنی بەدفەڕ ‹کەنگێ ئەو زاڵمە پاک دەبێتەوە؟› ٤. *[مەجاز]* خەلاس بوون لە ئەرک و مەینەت ٥. *[کینایە]* لە پۆنی دەرهاتنی ژن؛ بێنوێژی نەمان ☰ ۱. پاک شدن ۲. از میان رفتن ۳. مُردن زشتخو ۴. فراغت یافتن ۵. پایان یافتن قاعدگی

**پاک کردن**: ۱. توێکڵ لێ‌کردنەوە ۲. خاوێن کردنەوەی دانەوێڵە ۳. بژار کردنی کێڵگە لە دڕک و داڵ ٤. *[مەجاز]* حیساب یەکلا کردنەوە؛ پاک لە پاک کردنی حیساب ☰ ۱. پوست کندن ۲. بوجاری کردن ۳. وجین کردن ۴. تسویه حساب کردن

**پاک کردنەوە** خاوێن کردنەوە؛ تەمیس کردن ☰ تمیز کردن

**پاکەوە بوون**: ۱. خاوێن بوونەوە؛ پاک بوونەوە ۲. *[پلار]* مردنی مرۆڤی بەدفەڕ ☰ ۱. تمیز شدن ۲. مُردن بدسگال

**پاک**[2]: ناوەڵکار. گش؛ یەکسەر؛ هەموو؛ تەواو؛ تێکڕا ‹بە ناز و عیشوە پاک ئەرواحی پاکانی موسەخخەر کرد/ بە غەمزە خاترانی دایە بەر تیری نەزەر لە نوێ «مەحوی»› ☰ تمام؛ بی کم و کاست

**پاک**[3]: پێشوشە. ۱. خاوێن و بێ‌گرێ ‹پاکنووس› ۲. بە تەواوی؛ هەموو ‹پاکرن› ☰ ۱. پاک ۲. تمام

• **پاک**[4]: پاشوشە. بێ دەغەز؛ جێ متمانە ‹چاوپاک؛

دەسپاک› ■ ـ پاک

**پاکار / pakar/**: ناو. دەسیار؛ دەستیار؛ پێشکار؛ بەردەست؛ وەردەس؛ گزیر؛ هەیتە؛ شاگرد وەستا ■ پاکار؛ وردست

**پاکان / pakan/**: ناو. پیاوچاکان ■ نیکان

**پاکانە / pakane/**: ناو. ١. پێ‌پاکی؛ فحێل؛ پەرێش؛ پەرهێش؛ کار و ڕەوتی تۆمەت سڕینەوە ‹هێنامیە دەرێ لە پەردەکەی خاک/ پاکانەمی کرد لە لای خودای تاک «هەژار، *مەم و زین*»› ٢. پاسا؛ کۆشش بۆ بەرێوەچێ نیشان دانی کارێک ‹ئەوێ ڕۆژێ کە ناهەقان پاکانەیان سوودێکیان پێ ناگەیەنێ و ... «هەژار، *قورئان*»› ■ ١. تبرئه ٢. توجیه

⊡ **پاکانە کردن** ١. سڕینەوەی تۆمەت ٢. پاسا کردن ■ ١. تبرئه کردن ٢. توجیه کردن

**پاکایی / pakayî/**: ناو. ١. جێگەی خاوێن ٢. دۆخی خاوێن بوون ‹هەر چەندە دەیشۆم پاکایی نایەت›. هەروەها: **پاکایی هاتن** ■ ١. جای تمیز ٢. پاکیزگی

**پاکتاو**[1] **/ paktaw/**: ئاوەڵناو. بێ‌گەرد؛ خاوێن؛ پاقژ ■ پاکیزه

⊡ **پاکتاو کردن** ١. خاوێن کردنەوە ٢. هیچ نەهێشتن و گش لە گشتی شتێ بردن ‹هەرچی خورما بوو پاکتاوی کرد!› ■ ١. تمیز کردن ٢. هیچ باقی نگذاشتن

**پاکتاو**[2]: ئاوەڵکار. تێکڕا؛ گشت ‹مووی سەر بە چەرمەوە بگروون/ بڕۆ و سمێڵ پاکتاو بدروون «گۆران»› ■ به تمامی؛ از دم

**پاکداوێن / pakdawên/**: ئاوەڵناو. هێمۆ؛ داوێن‌پاک ■ پاکدامن

**پاکڕن / pakřin/**: ئاوەڵناو. ١. تایبەتمەندی دروێنەوانێک کە لە بنەوە دەستی دەگرێ و بنبڕ دەیدوورێتەوە ٢. *(مەجاز)* تایبەتمەندی کەسێ لە خواردندا گوێی بۆ خۆش و ناخۆش شل نییە ■ ١. کاربلد (دروگر) ٢. همه‌چیزخوار

**پاکژ / pakij/**: ئاوەڵناو. ١. خاوێن؛ تەمیس؛ پاقژ ٢. پاوان؛ کۆدە؛ جێ لەوەڕی قەدەغە ■ ١. پاکیزه ٢. قُرُق (مَرتع)

**پاکژی / pak(i)jî/**: ناو. خاوێنی؛ پاکی؛ پاقژی؛ تەمیسی ■ پاکیزگی

**پاککراو / pakk(i)raw/**: ئاوەڵناو. پاقلیر؛ کۆسە؛ پاکلیر ■ پوست‌کنده

**پاکلەپاک / paklepak/**: ئاوەڵناو. بێ‌حەساب ■ بی‌حساب

⊡ **پاکلەپاک کردن** یەکلا کردنەوە؛ تەخت کردن ■ تسویه کردن

**پاک لە پاک کردنەوە** حەق سەندنەوە؛ تۆڵە کردنەوە ■ تلافی کردن

**پاکلیر / paklîr/**: ناو. ١. ☜ **پاقلیر** ٢. توێخڵی سەوزی گوێز ■ ١. ☜ **پاقلیر** ٢. پوستەی سبز گردو

**پاکڵ / pakił/**: ناو. پاکڵە: ١. ئاگرهەڵکەر ٢. کڵی پرد؛ پایەی پرد ■ ١. افروزندەی کوره ٢. پایەی پُل

**پاکڵە / pak(i)łe/**: ☜ **پاکڵ**

**پاکنووس / paknûs/**: ناو. کاری نووسینەوەی ڕێک‌وپێک و بێ‌هەڵەوپەڵەی دەستی ئاخر ■ پاکنویس

**پاکوپاراو / pak û paraw/**: ئاوەڵناو. پاک‌وپوار؛ پاک و خاوێن ■ تر و تمیز

**پاکوپوار / pak û p(i)war/**: ☜ **پاکوپاراو**

**پاکوپوختە / pak û puxte/**: ئاوەڵناو. پاک و خاوێن؛ ترک‌وتەمیس ‹ماشەڵڵا، منداڵەکانی چەنێ پاک‌وپوختەن!› ■ تر و تمیز

**پاکوپووک / pak û pûk/**: ئاوەڵناو. زایە؛ خراپ؛ خەسار؛ هەدەر ■ تباه

⊡ **پاکوپووک کردن** بە فیڕۆ و خۆڕایی لە دەست دان ‹دەسمایەکەی پاک‌وپووک کرد› ■ هدر

دادن؛ تباه کردن

**پاکوپیس** / pak û pîs/: ئاوەڵناو. چاکوخراپ؛ ڕندوکرێت ≡ نیک و بد

▣ **پاکوپیس کردن**: چاک لە خراپ هەڵاواردن ≡ خوب از بد جدا کردن

**پاکوت** / pakut/: ☜ **پاشێل**

**پاکوتکی** / pakutkî/: ☜ **پاکوتە**

**پاکوتە** / pakute/: ناو. پاکوتکی؛ لەجێ؛ دەرجا؛ کار و ڕەوتی لە جێ خۆوە پێ هەڵێنان و بە زەویدا دان ≡ درجا

**پاکوڕە** / pakuře/: ناو. نۆکەر؛ خزمەتکاری پیاو ≡ نوکر

**پاکوڵ** / pakuł/: ئاوەڵناو. پێکورت؛ پێکوڵ؛ قاچقوڵە ≡ پاکوتاه

**پاکون** / pakun/: ☜ **پاکەر**[1]

**پاکۆ**[1] / pako/: ناو. ۱. باوەشە گیای نەبەستراو ۲. دەسکەنەی گیا هێندەی لە بن باڵ بنرێ ۳. گیای درواوی بە سەر یەکدا کراوی نەبەستراو ≡ ۱. دسته گیاه بسته نشده ۲. مقدار گیاه به اندازه‌ی یک زیر بغل ۳. توده گیاه درو شده

▣ **پاکۆ دان**: دانە بەر پاکۆ؛ کۆکەن کردن؛ ڕنینەوەی گیا بە کوڵەداس ≡ چیدن گیاه با داس

**دانە بەر پاکۆ**: ☜ **پاکۆ دان**

**پاکۆ**[2]: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی ئالفجارێ کە گیای بێ‌کەڵک بۆ برینی تێدا نەبێ ‹ئالفی پاکۆ› ≡ ویژگی علفزار مرغوب

**پاکۆترە** / pakot(i)re/: ناو. پێچوێلەکە؛ پێمجیلکە؛ پێ‌مریشکە؛ گیایەکە دەخورێ ≡ گیاهی خوردنی

**پاکۆرە** / pakore/: ناو. کلۆی پێرۆ؛ کولۆ تا باڵی نەگرتووە ≡ ملخچه‌ی نابالغ

**پاکۆڵ** / pakoł/: ناو. ۱. بەچکەورچ ۲. سمکۆڵ ≡ ۱. تولەخرس ۲. سُمکوبی

**پاکە** / pake/: ناو. خاوێنی؛ پاکی؛ تەمیسی ≡ تمیزی

**پاکەپاکە** / pake pake/: ناو. پەتاتە؛ کارتۆفل؛ سێفەزەمینە؛ سێفەزەمینی ≡ سیب‌زمینی

**پاکەت** / paket/: ناو. دەفری کاغەزین بۆ نامە و هەرچی ≡ پاکت

**پاکەر**[1] / paker/: ناو. پاکون؛ ڕەنک؛ ماکێکی لاستیکی بۆ پاک کردنەوەی نووسراوە ≡ مداد پاک‌کن

**پاکەر**[2]: ئاوەڵناو. خاوێن‌کەرەوە؛ بە تایبەتمەندی پاکەو کردن ≡ پاک‌کننده

**پاکەڕەشێڵە** / pakeřeşîłe/: ناو. یاوز؛ گیایەکە بۆ دەرگا پێ‌کردنی دمەڵ بە کاری دێنن ≡ اسفرزه

**پاکەمتار** / pakemtar/: ناو. پاکەمتیار؛ گیا خەڕوو؛ گیاخورو ≡ خرنوب

**پاکەمتیار** / pakemt(i)yar/: ☜ **پاکەمتار**

**پاکەمی** / pakemî/: ناو. ماندوویەتی؛ شەکەتی؛ مانگی ≡ خستگی

**پاکەن** / paken/: ☜ **پاکەنە**

**پاکەند** / pakend/: ☜ **پاخەند**

**پاکەنە** / pakene/: ناو. کەوشکەن؛ پاکەن؛ جێگەی کەوش داکەندن ≡ کفش‌کن

**پاکەوان** / pakewan/: ناو. (!) سپوور؛ کەنناس؛ کۆڵان‌ماڵ؛ زبیل‌ڕێژ ≡ رُفتگر

**پاکەوانی** / pakewanî/: ناو. (!) ۱. دامەزراوەیەک بۆ پاک و خاوێن کردنەوەی ژینگە ۲. کار و پیشەی سپوور ≡ ۱. اداره‌ی مسئول نظافت محیط زیست ۲. رُفتگری

**پاکی** / pakî/: ناو. پاکێتی؛ خاوێنی؛ تەمیسی؛ پاکە ≡ پاکی؛ تمیزی

**پاکیزە** / pakîze/: ئاوەڵناو. پاک؛ خاوێن؛ تەمیس ≡ پاکیزه

**پاکێتی** / pakêtî/: ☜ **پاکی**

**پاکێش** / pakêş/: ناو. یەکسم ☰ ستور

**پاگا** / paga/: ناو. بواری چەم ☰ گُدار رودخانە

**پاگرە** / pag(i)re/: ناو. واریس؛ فیلپا؛ پاماسی؛ نەخۆشی قاچ و قول ئەستوور بوون ☰ واریس؛ داءالفیل

**پاگورگانە** / pagurgane/: ناو. لالە؛ هەلالە؛ هەرالە ☰ لالە

**پاگوریانە** / paguryane/: ناو. لالە؛ هەلالە؛ هەرالە ☰ لالە

**پاگوشا** / paguşa/: ☜ **پا کردنەوە، پا**

**پاگۆ** / pago/: ناو. پەرسڤ؛ وەلام؛ وەرام؛ جواو ☰ پاسُخ

**پاگە** / page/: ناو. ١. داری ژێر ڕێسمەی دەرگا ٢. تەوێلە؛ ئاغەڵەمەڕ ☰ ١. چوب زیر پاشنەی در ٢. آغُل؛ طویله

**پاگیر** / pagîr/: ئاوەڵناو. پڕ لە گیر و گرفت؛ هۆی نەپەرژان بە کاری سەرەکیدا ☰ دستوپاگیر

**پاگیرە**[1] / pagîre/: ناو. دەپی ژێر پای جۆلا ☰ تختەی زیر پای جولا

**پاگیرە**[2]: ئاوەڵناو. دەزگیراندار (بۆ کچ) ☰ نامزدشدە (دختر)

**پاگێرە** / pagêre/: ناو. خەرمانێ کە بە پا دەکوترێ ☰ خرمن پاکوب

**پال** / pal/: ☜ **پاڵ**

**پالاخ** / palax/: ☜ **پالاخ**

**پالادیوم** / paladyum/: ناو. توخمی کیمیایی کانزایی بە ژمارەی ئەتومی ٤٦ و کێشی ئەتومی ١٠٦،٤، کانزایەکی سپی زیوی و نەرمە ☰ پالادیُم

**پالال** / palal/: ناو. گولێکە کوێستانی ☰ گلی کوهستانی

**پالان** / palan/: ناو. کۆپان؛ کورتان ☰ پالان

**پالاوش** / palawiş/: ☜ **پالاوەژ**

**پالدانک** / paldanik/: ناو. پاڵپشت: ١. شوێنی پاڵ پێوە دان ٢. [کنایە] پشتگر؛ پشتیوان ☰ ١و٢. تکیەگاه

**پالدێم** / paldêm/: ناو. پالدم؛ پشتەوەی داوێن ☰ پشت دامن

**پالمتە** / palimte/: ناو. گیایەکە بنەکەی لە بنی ئالەکۆک دەکا ☰ گیاهی است

**پالمە** / palme/: ناو. جۆرێک ئەسپنگی گەلاپان ☰ نوعی شنگ برگ پهن

**پالۆ**[1] / palo/: ناو. کۆلووی تەندوور ☰ خمیر سوختە در تنور

**پالۆ**[2]: ئاوەڵناو. تەمەڵ؛ تەوەزەل ☰ تنبل

**پالۆش** / paloş/: ئاوەڵناو. پرش؛ تێکەڵ ☰ مخلوط

**پالۆنە** / palone/: ناو. پالۆنە؛ جۆرێ کەوگیری وەک پالوێنە؛ کەوگیری کون ـ کون ☰ کفگیر سوراخدار

**پالو** / palû/: ناو. بالووک؛ بالووکە؛ بالۆکە ☰ زگیل

**پالوتە** / palûte/: ناو. ١. گەل؛ کاری بە کۆمەڵ ٢. بێگاری بە گەل ☰ ١. کار گروهی ٢. بیگار جمعی

**پالوڤ** / palûv/: ناو. پالوو: ١. لاتەڕاف؛ لاتەرافە؛ خالیگە ٢. پالێڤ؛ پالۆ؛ پالدوو ☰ ١. پهلو ٢. رانکی

**پالە** / pale/: ☜ **پاڵە**

**پالەتی** / paletî/: ناو. ڕەنجبەری؛ کرێکاری؛ کاری پالە ‹سالەکی پالەتی کربیە› ☰ کارگری

**پالەرزە** / palerze/: ناو. ژەمی نێوان فراوین و شێوی کرێکار (کە برسی دەبێ و پای دێتە لەرزین) ☰ عصرانەی کارگر

**پالەقۆچە** / paleqoçe/: ناو. سەرمەقولانج؛ سەرمەقولات ☰ مُعلَّق

**پالەقە** / paleqe/: ناو. پێلەقە؛ پێلاقە: ١. جووتە؛ لووشک ٢. لاقەفرتە؛ پەلەقاژە ☰ ١. لگدپرانی ٢. تلاش مذبوحانە

**پالەوی** / palewî/: ☜ **پاڵەوی**

**پالیر** / palîr/: ناو. شوورەی دەوری باخ ☰ پرچین اطراف باغ

**پالیک** / palîk/: ناو. بەرسمێڵ؛ مووی سمێڵ کە درێژ بێتەوە و بکەوێتە سەر ڕدێن ☰ موی بلند سبیل کە بر ریش آید

**پالیمۆک** / palîmok/: ناو. گیایەکە بنەکەی دەخورێ ☰ گیاهی با ریشەی خوراکی

**پالینان** / palênan/: ناو. پاڵێن؛ ئێواران کاتی مەڕ دۆشین ☰ عصر هنگام زمان دوشیدن گوسفندان

**پاڵ**[1] / paɫ/: ناو. پاڵ؛ پار: ١. پشت ‹پاڵ بدە بە بەردەوە نەک بە نامەردەوە «مەسەل»› ٢. ئەندەروون ‹لە پاڵ خۆیدا توورەیە› ٣. بنار و قەدی کێو ‹هەڤالین مە دانە پالی› ٤. ملەی کێو ‹لەو پالە سەری دەرێنا› ٥. بۆق؛ دەڵەک؛ کاری ڕەتاندن بەهێز ‹بە پالێ خستییە چالێ «مەسەل»› ٦. تەنیشت ‹بە شەو ژان و پەژارەم دێنە پالێ/ بە ڕۆژ ئۆقرەم نییە ساتێ لە مالێ «هێمن»› ☰ ١. تکیە ٢. درون ٣. کمر کوە ۴. ستیغ کوە ۵. هُل ۶ کنار؛ بغل

⊞ **لە پاڵ** لە کن: ١. لە قەراخ؛ لە کنار ‹پەین و پالێ کە لە پالی دێیە/ مەنزلی نۆکەری خۆتی لێیە «سوارە»› ٢. وێڕای؛ هاوڕێ ‹لە پال جوانی کەمالیش دەبێ هەبێ› ٣. لەگەڵ؛ ڕەگەڵ ‹کاکە! با ئەمەشی لە پال بێ› ☰ ١. کنار ٢. با ٣. همراه

⊡ **پاڵ پێوەدان**: ١. پشت پێوەدان ٢. پشت پێ بەستن ☰ ١. تکیە دادن ٢. تکیە کردن

**پاڵ پێوەنان**: بەهێز جوولاندن؛ بۆق پێوە نان؛ دەفعاندن ‹نییە تەنیا پەریزادێ کە پالم پێوە نێ نازی/ کە بەهرەی سیس و ژاکاوم ببووژێنێتەوە ڕازی «هەردی»› ☰ هُل دادن

**پاڵ خستن**: خستنە سەر لا؛ فڕێ دانە سەر تەنیشت ☰ بر پهلو انداختن

**پاڵ دان**: ١. پشت بە شتێکەوە دان ٢. بەهێز وە جوولە خستنی شتێ ☰ ١. تکیە دادن ٢. هُل دادن

**پاڵ دانەوە**: ١. سانەوە؛ حەسانەوە ٢. پشت بە پالپشتەوە دان ‹پالی دا وە پال سەکۆی بەرهێوان/ قەمچی زولفەکەی سەری لێم شێوان «فولکلۆر»› ٣. شتێ یا کەسێ نانە پال شتێکیتر ‹ئەو مێزە پال بدەرە دیوارەکەوە!› ☰ ١. استراحت کردن ٢. تکیە دادن ٣. در کنار (چیزی) نهادن

**پاڵ کەفتن**: ☜ **پاڵ کەوتن**

**پاڵ کەوتن**: پال کەفتن؛ ڕاکشان؛ لە سەر لا درێژ بوون ‹ئەمجار ئەوانەی ئەکەونە لاتی/ لێی پال ئەکەون لەوێ بە ماتی! «بێکەس»› ☰ دراز کشیدن

**پاڵ لێدانەوە**: ئارخەیان بوون ☰ آسودن

**پاڵ نان**: ١. پال دان؛ دەست پێوە نان ٢. پال خستن؛ ڕاکێشان ☰ ١. هُل دادن ٢. بر پهلو انداختن

**پاڵۆ دان**: شان داهێلان؛ هەلاژیان؛ لەمەو داین ☰ لم دادن

**کردنە پاڵ**: ١. لە پەنای شتێ داکردن ٢. ئەتک کردن ‹پیاویان کردە پالێ› ☰ ١. در کنار چیزی قرار دادن ٢. تجاوز کردن

**لە پاڵ بوون**: هاوسەری کەسێ بوون ‹کاک هیوا خوشکی وریای لە پالدایە› ☰ همسر بودن

**پاڵ**[2]: ناوەلناو. تور؛ زمان بەگرێ ‹کەڕن، کوێرن، لالن، پالن، ناتوانن بشگەڕێنەوە «هەژار، *قورئان*»› ☰ الکن

**پاڵ**[3]: ئامراز. لای؛ لە پەنای ☰ بغلِ

**پاڵـ**[4]: پێشوشە. ١. بەر ‹پالداوێن› ٢. لا؛ پەنا ‹پالدەس› ٣. پا؛ خوار ‹پالدامێن› ☰ ١. ـ پایە ٢. بغل ٣. پایین

. **پاڵ**۵: پاشەوشە. ١. ـ پاڵێو؛ پاڵفتەکەر ‹ئاوپاڵ› ٢. لە پێکهاتەکاندا بە مانای پەنا و شوێنێکی بەرز و ڕاوەستاوە کە دەتوانی بچییە پەنای و بتپارێزێ (زۆرتر کێو دەگرێتەوە) ‹بەرپاڵ؛ قەدپاڵ؛ لاپاڵ› ☰ ١. پیواژه به معنی پالاینده ٢. جانب

**پاڵ**٦: پێرۆ. ← **پەین‌وپاڵ؛ لاڵ‌وپاڵ؛ پشت‌وپاڵ**

**پاڵا**١ / pała/: ناو. پێڵاو؛ پێتاو؛ کاڵە؛ کەوش و کەلاش و چەکمە ‹ئیسە پەی دووری قیبلەم مەنالوو/ گەرد پا و پالاش وە مژە مالوو «بێسارانی»› ☰ پای‌افزار

. **پاڵا**٢: پاشەوشە. ـ پاڵێو ‹برنج‌پالا› ☰ پالاینده

**پاڵاخ** / pałax/: ناو. پالاخ؛ پالاغ: ١. گوێلکی گامێش ٢. پڕ و پووشی وشک ٣. *[بەلار]* زل و نەفام ☰ ١. گوسالەی گاومیش ٢. خس‌وخاشک ٣. یاردانقلی

**پاڵادرو** / paład(i)rû/: ناو. پێڵاودروو؛ کەوش‌دوور ☰ کفش‌دوز

**پاڵادڕانە** / paład(i)řane/: ناو. پالامز؛ مزی پێ؛ نرخی کاڵەدڕان ☰ حق‌القدم؛ پایمُزد

**پاڵاس** / pałas/: ناو. ئەسپابی ناوماڵ ☰ اثاثیەی منزل

**پاڵاغ** / pałağ/: ☜ **پاڵاخ**

**پاڵافتن** / pałaftin/: چاوگ. بە پاڵوێنەدا کردن؛ ساف کردنی تراو ☰ پالایدن

**پاڵافتە** / pałafte/: ناوەڵناو. پاڵێوراو؛ بە پاڵوێنەدا کراو؛ تراوی لە خلتەوپلتە پاقژکراو. هەروەها: **پاڵافتە بوون؛ پاڵافتە کردن** ☰ پالاییده

**پاڵامز** / pałamiz/: ناو. پالادڕانە؛ نرخی کاڵەدڕان؛ ئەوی هەر ماڵێک ئەیدەن بە شوان بۆ قەرەبووی پالا ☰ حق‌القدم؛ پایمزد

**پاڵان** / pałan/: ناو. کۆپان؛ کورتان ‹وا دەزانی زینەکەی پالانی پووشە گردە کویت! «سالم»› ☰ پالان

**پاڵانتە** / pałante/: ناو. لەتە ئاجۆر ☰ پارەآجر

**پاڵانچە** / pałançe/: ناو. ١. دوو ماسوولکەی درێژی تەنیشت مۆرەغەی پشت، لە پشتی ملەوە تا سەری سمت ٢. قسڵ و بەردێ کە لێواری جۆگەی پێ دادەبەستن ٣. پالانە؛ تیسکە خوری هەڵنەپاچراو بە پشتی بەرانەوە بۆ جوانی ☰ ١. ماهیچەهای راستەی دو طرف ستون فقرات ٢. سنگ و آهک لب جوی ٣. پشمی که برای زینت بر پشت قوچ باقی می‌گذارند

**پاڵاندروو** / pałand(i)rû/: ناو. کۆپاندۆز ☰ پالان‌دوز

**پاڵاندن** / pałandin/: چاوگ. پالاوتن ☰ پالودن

**پاڵانە** / pałane/: ☜ **پاڵانچە ـ٣**

**پاڵانی** / pałanî/: ناو. ١. بارەبەر؛ جاشێ کە کاتی بار کردنی گەیشتبێ ٢. بارگیر؛ بارگین؛ ئەسپی باری ‹گوێ‌درێژی بار و کورتان بەرز و پالانی‌بەزین/ چوست و وریاتر لە گوێ کورتانی پالانی و گێژ «نالی»› ☰ ١. کُرّه‌ای که وقت بار کردنش رسیده است ٢. یابو

**پاڵاو** / paław/: ناوەڵناو. پالافتە ‹پالاوی ڕژاند و تلتی نۆشی/ وەک فارسی وا زمانی خۆشی «هەژار، *مەم و زین*»› ☰ پالاییده

**پاڵاوتران** / paławt(i)ran/: چاوگ. پاڵێوران؛ پالفتە بوون ☰ پالوده شدن

**پاڵاوتن** / paławtin/: چاوگ. تێنەپەڕ. //پالاوتت؛ دەپالێوی؛ بپالێوە// پالافتن؛ بە پاڵوێنەدا بواردن؛ بەر پالوێنە دان ‹شکا بێگانە، پالاوتی لە ترسان/ کوڕی کورد! هاتەوە دیسان هەڵی تۆ «هێمن»› ☰ پالودن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: پالاوتە/ چاوگی نەرێنی: نەپالاوتن

**پاڵاوتە** / paławte/: ناوەڵناو. پالافتە ☰ پالاییده

**پاڵاوراز** / paław(i)raz/: ناو. کەوشدرووی؛

کەوشدۆز؛ پێڵاودروو؛ پینەچی ☰ کفّاش

**پاڵاوگە** / paławge/: ناو. پاڵێوگا؛ شوێنی پاڵاوتنی نەوت ☰ پالایشگاه

**پاڵاوەژ** / paławej/: ناو. پاڵاوش؛ پاڵاوەش؛ پاکەنە؛ کەوش‌کەن ☰ کفش‌کن

**پاڵاوەش** / paławeş/: ☜ پاڵاوەژ

**پاڵبەپاڵ** / pałbepał/: ناوەلکار. شانبەشان؛ پێکەوە؛ پێکڕا ☰ دوشادوش

**پاڵپشت** / pałpişt/: ناو. ١. ئەوەی پشتی پێوە دەدەن بۆ سانەوە ٢. پشتەمێر؛ داژدار ٣. هەڤپشت؛ پشتیوان ☰ ١. مُتکا ٢. پارتی ٣. پُشتیبان

**پاڵتاو** / pałtaw/: ناو. ١. پاڵتۆ؛ باڵتۆ؛ باڵتە؛ پاڵتە؛ سامتۆر؛ ساقۆ؛ ساکۆ؛ بالاپۆشی شۆڕ لە قوماشی ئەستوور ٢. پاڵوو؛ کەژووی بن کلکی بارەبەر ☰ ١. پالتو ٢. پالدُم

**پاڵتمە** / pałtime/: ☜ پاڵمە

**پاڵتۆ** / pałto/: ☜ پاڵتاو-١

**پاڵتە** / pałte/: ☜ پاڵتاو-١

**پاڵتەک** / pałtek/: ناو. نەخۆشی گەرووی ئاژەڵ ☰ گلودرد دام

**پاڵدامێن** / pałdamên/: ناو. پاڵداوێن؛ پاڵداینە؛ بناری کێو ☰ دامنەی کوه

**پاڵداوێن** / pałdawên/: ☜ پاڵدامێن

**پاڵداینە** / pałdayne/: ☜ پاڵدامێن

**پاڵدراو** / pałd(i)raw/: ناوەلناو. پەسارده ☰ تکیەداده

**پاڵدرمە** / pałdirme/: ☜ پاڵمە

**پاڵدم** / pałdim/: ناو. پشتەوەی داوێن ☰ پُشت‌دامن

**پاڵدوو** / pałdû/: ناو. پاڵوو؛ پاڵم؛ کەژووی بن کلکی بارەبەر ☰ رانکی

**پاڵدەس** / pałdes/: ☜ پاڵدەست

**پاڵدەست**[1] / pałdest/: ئامراز. پاڵدەس؛ لە تەنیشت ‹پاڵدەست خاڵم دانیشتم› ☰ بغل‌دستِ

**پاڵدەست**[2]: جێناو. پاڵدەس؛ ئەوەی لە پاڵ دەستدایە ‹پاڵدەستەکەمیان بالبەست کرد› ☰ بغل‌دستی

**پاڵدەسی** / pałdesî/: جێناو. بن‌دەسی؛ ئەوی لە پەناوە ☰ بغل‌دستی

**پاڵس** / pałs/: ناو. یەکەی دیاری کردنی خەرجی تەلەفوون و موبایل ☰ پالس

**پاڵسەنگ** / pałseng/: ☜ پارسەنگ

**پاڵشا** / pałşa/: ناو. پاشا؛ پاتشا ☰ پادشاه

**پاڵشت** / pałişt/: ناو. ١. جێگەی پاڵ پێوەدان ٢. باڵنج؛ سەرنگا؛ سەرین ☰ ١. تکیه‌گاه ٢. بالش

**پاڵفتە** / pałifte/: ناوەلناو. ١. پالافتە؛ پاڵێوراو ٢. دابێژراو؛ هێلەک‌کراو ☰ ١. پالاییده ٢. بیخته

**پاڵکەفتە** / pałkefte/: ناوەلناو. ڕاکشاو؛ هەلاژیاو ☰ درازکشیده

**پاڵکی** / pał(i)kî/: ☜ پاڵەکی

**پاڵگان** / pałgan/: ناو. پاڵگانە؛ بالکون ☰ بالکن

**پاڵگانە** / pałgane/: ☜ پاڵگان

**پاڵگە** / pałge/: ناو. بەشی پان‌کراوەی ڕێگاوبان کە بۆ لادان و ڕاگرتنی ماشین دابین کراوە ☰ پارکینگ کنار جاده

**پاڵم** / pałim/: ☜ پاڵدوو

**پاڵمە** / pałme/: ناو. پاڵتمە؛ پاڵدرمە؛ جۆرێک ئەسپنگی گەلاپان ☰ نوعی شنگ برگ پهن

**پاڵنگ** / pałing/: ☜ پڵنگ[1]

**پاڵوانە** / pałwane/: ناو. ١. پارزن؛ پاڵوێنە؛ ڕاوک ٢. پەڕەسێلکەی ڕەشی باڵ درێژی قاچ کورت ☰ ١. پالونه ٢. چلچله

**پاڵوێنکە** / pałwênke/: ☜ پاڵوێنە

**پاڵوێنە** / pałwêne/: ناو. پاڵوێنکە؛ پارزن؛ ڕاوک؛ شیرپاڵۆ؛ ئەو پارچە بووزووەی تراوی پێ‌دەپاڵێون (زۆرتر بۆ شیر) ☰ پالونه

**پاڵۆ** / palo/: ☜ **پاڵو**

**پاڵۆش** / paloş/: ئاوەڵناو. تێکەڵ؛ ئاوێتە ≡ آمیخته

**پاڵۆنە** / palone/: ☜ **پاڵۆنە**

**پاڵو**[1] / pałû/: ناو. پاڵۆ: ١. کەژوو یـان گوریسـی بنکلکگری بارەبەر ‹ئەگەر کەسێک ولاخێکی دا بە کرێ بۆ سواری، ئەبێ کورتان و ژێرکورتان و تەنگە و پالـوو و حەڵـقەی لـووتی حوشـتر و ئـەم جـۆرە پێویستیانەشی لەگەڵدا بداتێ «مەلا عەبدولکـەریم»› ٢. پـاڵ؛ تەنشـت ٣. کۆپـان؛ کورتـان ٤. پـاڵ؛ هـەرکام لـە رووبـەرەکانی تـەختی دەرەوەی تەنێکی هیندسی ٥. دارێکە دەیدەنە بەر نێ کـە نـەبزوێ ≡ ١. رانکـی ٢. پهلـو ٣. پـالان ۴. وجـه هندسی ۵. چوبی که ناو آسیاب را بدان محکم کنند

• **پاڵو**[2]: پاشەوشە. ـ پاڵۆ؛ پاڵێو؛ پاڵـێوەر ‹چاپاڵـوو› ≡ پیواژه به معنی پالاینده

**پاڵوبەن** / pałûben/: ئاوەڵناو. پشتیوان؛ داژدار ≡ هواخواه

**پاڵوپساو**[1] / pałûp(i)saw/: ئاوەڵناو. پەراسووشکاو ≡ جناغشکسته

**پاڵوپساو**[2]: ئاوەڵکار. بە پەراسووشکاوی ‹ئاسمـان تەرزەی کە لێ دا بەردەبارنمان ئەکا/ سـوختەکانمان رادەکـەن، پالووپسـاو و قـوونڕاو! «نـالی»› ≡ پهلوشکسته

**پاڵـودە** / pałûde/: نـاو. فالـوودە؛ خواردنێکـە ڕشتەئاسا، لە نیشاستە دروسـت دەبـێ، تێکەڵـی شەربەتی قەند و عارەقـەی بۆنخۆشـی دەکـەن و دەیخۆنەوە ≡ فالوده

**پاڵوگیر** / pałûgîr/: ناو. ١. دەپێکە بـۆ ڕاسـتە و پاستەی دۆلاش بە کار دێ ٢. برینی بن کلک لە بەر زبری پالوو ≡ ١. وسیلەی تنظیم در آسیا ٢. زخم حیوان ناشی از زبری رانکی

**پاڵـە** / pałe/: ناو. پالە: ١. شاری گەورە ٢. دەربار و دیوەخانی گەورەپیاوان ٣. درەوان؛ دروێنـەوان ‹پاڵـە ناتوانـێ و بیـانووی هەسـانە «مەسـەل»› ٤. کرێکار؛ فەلە؛ کاریەر ٥. سەپان؛ ڕەنجبەری پێنج یەک بەری داهات یان سـێ یـەک بـەر ٦. پەڵـە دەغڵی نەدرواو ≡ ١. شهر بزرگ ٢. دربار بزرگان ٣. دروگر ۴. کارگر ۵. رنجبر سـهمیەگیـر ۶. قطعـەای از غلّەی درو نشده

**پاڵەپەست** / pałepest/: ☜ **پاڵەپەستۆ**

**پاڵەپەسـتۆ** / pałepesto/: نـاو. پاڵەپەسـت؛ پاڵەپەسێو؛ گوشـار؛ فشـار؛ تـەوژم ‹پاڵەپەسـتۆی مەینەتە ئەمڕۆ بە سەر کوردا گلا/ نیشتمانی کـوردی کردە جێگە ڕاو و کاروزار «قانع»› ≡ فشار

▣ **پاڵەپەستۆ دان**: گوشار و ئازار دان ‹بڕا نێفـەک، دڕا سـەرپێچ و دەسمـاڵ/ بـڕا کیـژ و دڕا کـوڕ پاڵەپەستۆ «هێمن»› ≡ تحت فشار قرار دادن

**پاڵەپەسێو** / pałepesêw/: ☜ **پاڵەپەستۆ**

**پاڵەکی** / pałekî/: ناو. پاڵکی؛ کەژاوەی سەرئاوەڵا ≡ کجاوەی روباز

**پاڵـەمێر** / pałemêr/: ئاوەڵـناو. ١. هونەرمەنـد؛ بەهونەر ٢. زیرەک؛ وریا ≡ ١. هُنرمند ٢. زیرک

**پاڵـەنگ** / pałeng/: نـاو. ڕەشمـە؛ ڕێشـمە؛ هەوسارۆکە ≡ افسار

**پاڵـەوان** / pałewan/: نـاو. پەڵـەوان؛ پەهلەڤـان؛ پەحڵـەوان: ١. قارەمـان؛ مـرۆی زۆر ئـازا ٢. کەسـایەتی نەبـەزی چیرۆکـان ٣. دارێ کـە دەخرێتە بن کاریتەوە ٤. تەنافباز ≡ ١. پهلوان ٢. قهرمان داستان ٣. چوب زیر دیرک ۴. بندباز

**پاڵـەوانبازی** / pałewanbazî/: نـاو. زۆرانی؛ زۆرانبـازی؛ زۆرەوانی؛ زۆرەبـانی؛ عـەفرە ≡ زورآزمایی

**پاڵەوانپەمـە** / pałewanpeme/: نـاو. *[پـلار]* پاڵەوانفسفس؛ خۆهەڵکێشی هیچ لێنەهاتوو ≡ پهلوانپنبه

**پاڵـەوانفسفس** / pałewanfisfis/: ☜

**پاڵەوان‌پەمە**

**پاڵەوانە** / pałewane/: ناو. ١. بەرێکی دار مازوو ٢. پشتیوانەی دیواری شکست ٣. داری بن دیرەگ ٤. پالوانە؛ چەورووکە؛ کاردەپەلە؛ بالداسووکە؛ تەیرەکوێرە؛ تەیرەحەوایلە ☰ ١. نوعی ثمر مازوج ٢. پشتیبانەی دیوار ضعیف ٣. شمعک ٤. بادخورک؛ پرستوی سیاه

**پاڵەوپشت** / pałewpişt/: ئاوەڵناو. ١. پشت‌وپەنا؛ پشتیوان ‹مەلێ خۆزگە دەزگیرانم/ پالەوپشتی ژیانم/ بمردایە! ... «سوارە»› ٢. ☜ **پشتی[1]-٢** ☰ ١. پُشت‌وپناه ٢. ☜ **پشتی[1]-٢**

**پاڵەوی** / pałewî/: ناو. ١. گوڵەبەڕۆژە ٢. پالەوی؛ زمانی سەردەمی ئەشکانی و ساسانی ٣. سکەی زێڕی سەردەمی پالەوی (١٣٠٤-١٣٥٧ ک. هـ.) لە ئێراندا ☰ ١. گل آفتاب گردان ٢. زبان پهلوی ٣. سکەی پهلوی

**پاڵەهەنگ** / pałeheng/: ناو. کۆت و زنجیری پای زیندانی ☰ زنجیر پای زندانی

**پاڵێ** / pałê/: ناو. ١. بێڵی دارین ٢. پالووی بارەبەر ☰ ١. پارو ٢. رانکی

**پاڵێن** / pałên/: ناو. ١. شوێنی وەستان و وچانی ڕان ٢. کاتی سەر لە ئێوارە ‹ئێستاش پالێنێ وەک جاران/ لە شوان و مێگەل دەڕوانی؟ «هێمن»› ☰ ١. جای استراحت گله ٢. دمِ عصر

⊡ **پاڵێن دان:** وچان دانی ڕان و بەرغەل ‹ڕان پالێنی داوە› ☰ لم دادن

• **پاڵێو** / -pałêw/: پاشەوشە. پالێوەر ‹برنج‌پالێو› ☰ - پالا

**پاڵێوران** / pałêwran/: چاوگ. تێنەپەر. نادیار. //پالێورای؛ دەپالێوری؛ بپالێورە// **پالافتن** ☰ پالوده شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: پالێوراو/ چاوگی نەرێنی: نەپالێوران

**پاڵێوراو[1]** / pałêwraw/: ناو. ناودێرکراو بۆ کاری ☰ نامزد

**پاڵێوراو[2]**: ئاوەڵناو. پالافتە؛ پالاوتە؛ پالێوکە ☰ پالوده

**پاڵێوکە** / pałêwke/: ☜ **پاڵێوراو[2]**

**پاڵێوگا** / pałêwga/: ☜ **پالاوگە**

**پاڵێوەر** / pałêwer/: ئاوەڵناو. پالافتە؛ سەپێ؛ نەسەلنایە ☰ تصفیه شده

**پاماسی** / pamasî/: ناو. پاگرە؛ واریس؛ فێلپا؛ واریسی پا ☰ واریس؛ داءالفیل

**پاماسێ** / pamasê/: ناو. پاگرە؛ نەخۆشی قاچ ئەستوور بوون ☰ پاغر

**پاماڵ** / pamał/: ئاوەڵناو. بەرپێدراو؛ لەبەین چوو؛ تەرت‌وتوونا ‹لەم ڕێگەیە تەقدیری ئەزەل وا بوو کە ئێمە/ پامالی جەفا بین و ڕەقیب سەیروسەفا کا «شێخ ڕەزا»›. هەروەها: **پاماڵ بوون؛ پاماڵ کردن** ☰ پایمال

**پاماڵکەر** / pamałker/: ئاوەڵناو. تەرت‌وتووناکەر ‹خەزان جەلابەخش خەم خەیالشەن/ پامالکەر گەنج شادی و مالشەن «بێسارانی»› ☰ پایمال کننده

**پاماڵە** / pamałe/: ناو. خێشک؛ ئامرازێ زەوی شۆکراوی پێ ڕێک دەکەن ☰ مالەی کشاورزی

**پاماو** / pamaw/: ناو. پامۆرە؛ کاری لووس کردنی سواغی گێچ بە پەڕۆی تەڕ. هەروەها: **پاماو کردن** ☰ عمل صاف کردن دیوار گچی با کهنەی خیس

**پامز** / pamiz/: ناو. مزی هاتن ☰ پایمُزد

**پامۆرە** / pamore/: ناو. ١. ☜ **پاماو** ٢. ☜ **پاموورە**

**پاموورە** / pamûre/: ناو. پامۆرە؛ پاوەن؛ پاوەند؛ پاوەنە؛ پاوێنە: ١. لیزگە مووروویی خشڵی قولەپێ ٢. خرخاڵی پا؛ پاوانە ☰ ١. رشتەی زینتی مچ پا ٢. خلخال مچ پا

**پامەڕە** / pameře/: ☜ **پێمەڕە**

**پامەس** / pames/: ناو. وتار؛ گوتار ≌ مقاله

**پامەلووچک** / pamelûçik/: ☜ **پێچۆلەکە**

**پامەلە** / pamele/: ناو. جۆرێک مەلە تەنیا بە لێدانی پا، بۆ ڕاوەستان لە ناو ئاو ≌ شنای ایستاده

**پامێدە** / pamêde/: ناو. شەک و کاوڕی دابەستە و قەڵەو و جوان ≌ برەی چاق و چلە و زیبا

**پامێزە** / pamêze/: ناو. ١. پلخەی مێشەنگوین کە دوای ئاو خواردن دەیکا و دەبێتە هۆی دۆزینەوەی شەڵخەمێشەکە ٢. کولکەی پەلی ئاژەڵ ٣. شاوەتی تەگە کە بە لاڕانیەوە وشک دەبێتەوە ≌ ١. مدفوع زنبور که از ردّ آن لانه‌اش را می‌یابند ٢. کُرک پای دام ٣. آب پشت تکه بر رانش

**پان** / pan/: ئاوەڵناو. پەحن؛ پەهن؛ بەرین؛ پیەن؛ پیەنی؛ پێن؛ تەپیاس؛ پۆڕ؛ هەراو؛ وله ‹ڕیشەکەی پان و درێژە، بۆ ڕیا خزمەت دەکا/ زاهیرە هەر کەس بە تووڵ و عەرزی ڕیشیدا ڕیا «نالی»› ≌ پهن

⊡ **پان بوونەوە** پانۆ/ پانەو/ پانەوە بوون: ١. دە بەر پێدا تلێخانەوە ٢. لە تەسکییەوە بەرین بوون ٣. *[پەلار]* ڕاکشان ≌ ١. زیر پا لە شدن ٢. پهن شدن ٣. لم دادن

**پان کردنەوە** ١. پێ ڕێ خستن ٢. لە تەسکەوە بەرین کردن ٣. ڕاخستنی سفرە و بەڕە و... ≌ ١. لە کردن ٢. گستراندن ٣. انداختن سفره و ...

**پانۆ/ پانەو/ پانەوە بوون** ☜ **پان بوونەوە**

**پانا** / pana/: ☜ **پانایی**

**پاناڤ** / panav/: ناو. پانتایی؛ دەشتایی ≌ پهنا

**پاناو** / panaw/: ناو. سەر چیای تەخت؛ تەختایی سەری کەژ ≌ جای هموار بر قُلّەی کوه

**پاناوک** / panawik/: ناو. ١. تەنکاو؛ ئەو جێگا لە چۆم کە پان و تەنک دەبێتەوە ٢. تەختایی و گۆڕایی لاقەدی چیا ≌ ١. جای عریض و کم‌عمق رودخانه ٢. فضای مُسطح در کمر کوه

**پاناوکە** / panawke/: ناو. گۆمیلکەی ئاو لە دەشتا ≌ برکه‌ای در میان جُلگه

**پانایی** / panayî/: ناو. پانا؛ پانی؛ پەهنی؛ پیەنای؛ پیەنی؛ پییەنا؛ هەیمە؛ بەر؛ وەر ≌ پهنا

**پان‌بەپان** / panbepan/: ئاوەڵکار. بەبێ ڕوودەروایسی؛ بە ئاشکرا ≌ رُک و پوست‌کنده

**پانپانۆکە** / panpanoke/: ناو. پانپانۆکێ؛ کاری خۆ بە یەکتر ڕەحەت کردنی ژنان ≌ عمل طبق زدنِ زنان

**پانپانۆکێ** / panpanokê/: ☜ **پانپانۆکە**

**پان‌پۆڕ** / panpoř/: ☜ **پانۆڵە**

**پانتا** / panta/: ناو. دووبەر؛ بەر؛ ڕووکار؛ ڕوو؛ سەلەندە؛ ڕووپەڕ؛ ڕووکاری هەر شتێک ≌ سطح

**پانتاپێو** / pantapêw/: ناو. ڕووپێو؛ ئەوەی زەوی لە گەز دەدا و دەیپێوێ ≌ مَسّاح

**پانتاو** / pantaw/: ناو. ١. پاناو؛ گۆڕەپان؛ گۆڕایی سەر چیا ٢. دەشتی پان و ڕاست و بێ زوورک ≌ ١. همواریِ قلەی کوه ٢. هامون؛ جلگەی هموار

**پانتایی** / pantayî/: ناو. پانایی؛ هەرایی؛ بەرینایی؛ بەرینی؛ هەراوی؛ سەلەندە؛ بەراوی؛ ئەندازەی بلاوی و ڕاخراوی شتێک ‹ئەو حەلە سەرانسەر ئەبێتە بەهەشت/ لە لووتکەی شاخەوە تا پانتایی دەشت «گۆران»› ≌ پهنا

**پانترۆڵ** / pant(i)řoł/: ☜ **پاتۆڵ**

**پانترۆن** / pant(i)řon/: ☜ **پاتۆڵ**

**پانتومیم** / pantumîm/: ناو. لاڵبازی؛ هونەری نیشاندان و گێڕانەوەی مەبەستێ بە جووڵانەوەی هەموو ئازای لەش جگە لە زبان کە جار و بار مووسیقاشی لەگەڵدایە ≌ پانتومیم

**پانتۆڵ** / pantoł/: ☜ **پاتۆڵ**

**پانتە** / pante/: ناو. کڕنووش؛ کاری داهاتنەوە بۆ ڕێز لێنانی کەسێ ≌ کُرنش؛ تعظیم

**پانجاڕ** / pancař/: ناو. بنەگیا؛ گیای خواردنی مرۆ، وەک شنگ و پنگ و گیای سوورەوە کردن

🇸 گیاهان خوراکی

**پانجاڕچن / pancařçin/:** ☜ **پانجاڕی**

**پانجـاڕی / pancaři̇̂/:** نـاو. پانجـاڕچن؛ گیـاچن؛ گیای خواردەمەنی هەڵکەن 🇸 گیاهکن

**پانجەقولێ / pancequlê/:** ☜ **پاشقول**

⊡ **پانجەقولێ دان:** ☜ **پاشقول لێدان**

**پانچ / panç/:** ناو. سمۆک؛ ئامرازی کون کردن 🇸 پانچ

**پاندا / panda/:** نـاو. ۱. گیانـەوەرێکێ گوانـداری وەک ورچە، گیـا دەخـوا و لـە ناوچـەی ئاسـیای ڕۆژهەڵاتدا دەژی، ۱,۸ میتر درێژە، کلکی کـورت و کولکەی زۆری بازەڵەی هەیە ۲. گیانـەوەرێکی گوانـداری پچووکـە، لـە ئاسـیای ڕۆژهەڵاتدایـە، ڕەنگی پێستی بەڕوویی ڕۆشـن یـان خورمـایی و کلکی درێژ و ئەستوورە 🇸 ۱. پاندا ۲. پاندای درختی

**پاندان / pandan/:** ناو. خۆنووس؛ ئـەو قەڵـەمەی مەرەکەفی دەپاڵ خۆی دەکرێ 🇸 خودنویس

**پانزدەهەم / panzdehem/:** ☜ **پازدەهەم**

**پانزە / panze/:** ☜ **پازدە**

**پانزەمین / panzemîn/:** ☜ **پازدەهەمین**

**پانزەهەم / panzehem/:** ☜ **پازدەهەم**

**پانزەهەمین / panzehemîn/:** ☜ **پازدەهەمین**

**پانزەیەم / panzeyem/:** ☜ **پازدەهەم**

**پانسمان / pans(i)man/:** ناو. برینپێچـی؛ کـاری شـتنی بـرین بـە دەرمـان و پـاک کردنـەوەی و مەڵهەم لێنان و پێچانی بە تەنزیف 🇸 پانسمان

**پانسەد / pansed/:** ☜ **پێنجسەد**

**پانسەدەم / pansedem/:** ☜ **پێنجسەدەم**

**پانسەدەمی / pansedemî/:** ☜ **پێنجسەدەمی**

**پانسەدەمین / pansedemîn/:** ☜ **پێنجسەدەمین**

**پانسەو / pansew/:** ☜ **پێنجسەد**

**پانک / pank/:** نـاو. ۱. مەڵاشـوو ۲. بزووتنـەوەی لاوانی ڕۆژاوا، دژ بە کۆمەڵ و بڕواکانی 🇸 ۱. سـق دهان ۲. پانک

**پـانکراس / pank(i)ras/:** نـاو. شـــیپیلک 🇸 لوزەالمعده

**پـانکراوە / pank(i)rawe/:** ئاوەڵنـاو. ڕاخـراو؛ داخریاگ 🇸 گُسترده (بستر)

**پانکە / panke/:** ناو. ۱. جۆرێ بەری دارمازوو ۲. جـۆرێ ماسـی گرۆفـەر ۳. پەنکـە؛ باوەشـێنی کارەبایی ٤. چنگنە؛ گەنەکەولە؛ جۆرێک مێرووی چکۆلەی پانکەڵەیە، مرۆ لیرگی پـێ دەردەکـا 🇸 ۱. نوعی ثمر مازوج ۲. ماهی سفید ۳. پنکه ۴. ساس

**پانکەڵـە / pankełe/:** ئاوەڵناو. پانی خـڕ و چکۆلـە ‹دا بانگ کە لـەو هـەتیوە پانکەڵـە بێـت بـزانم!› 🇸 پَتوپهن

**پانگ / pang/:** ناو. قولانچ؛ گوێل؛ مەودای نێـوان قامکەگەورە و قامکی شادە 🇸 باز

**پانگە / pange/:** ناو. وچخانە؛ خەڵوەتی؛ عەنباری دانەوێڵە 🇸 انبار غلّه

**پانگهە / pangihe/:** نـاو. ۱. پشـــتێر؛ گـــەوڕ ۲. هەماری گەنم و خەلە 🇸 ۱. طویله ۲. انبار غلّه

**پانوبـەرین / pan û berîn/:** ئاوەڵـناو. بـەرفراوان و گەورە ‹بان لەیلاخ، دەشتێکی پانوبەرینە› 🇸 وسیع

**پانوپلیش / pan û p(i)lîş/:** ☜ **پانوفلچ**

**پـانوپۆڕ / pan û poř/:** ئاوەڵـناو. *[پـلار]* ۱. زل و هەراو؛ زۆر گوشادی نابـەجێ ۲. تـەژەی ناوشـان پان 🇸 ۱. گل‌وگشاد ۲. پتوپهن

**پـانوفلچ / pan û filç/:** ئاوەڵـناو. پـانوپلـیش؛ بەرپێدراوی هەڵشـێلدراوی لەکارکەوتـە 🇸 لـە و لورده

**پانۆڵـە / panołe/:** ئاوەڵـناو. *[پـلار]* تێکسـمراوی کولەبنە؛ پان و کورت 🇸 پَتوپَهن

**پانەسێڵە / panesêłe/:** ئاوەڵناو. *[پلار]* پـانوپـۆڕ 🇸 پَتوپَهن

**پانـەگا / panega/:** نـاو. بانـەگا؛ جێگـەی ڕووانی

تووکەبەر 🇮🇷 زهار

**پانەوپان** / panewpan/: ئاوەڵکار. ١. بە لای پانایيدا ‹پانەوپان ڕایخە!› ٢. بە ئاشكرايی و بێ مەرایی ‹پانەوپان پێم‌گوت› 🇮🇷 ١. از پهنا ٢. رُک و پوست‌کنده

**پانی** / panî/: ناو. ١. بەرینی؛ پەهنی ٢. پاژنە؛ پانیه 🇮🇷 ١. پهنا ٢. پاشنه

**پانیه** / pan(i)ye/: ناو. پاژنە؛ پانی 🇮🇷 پاشنه

**پانیەدرێژە** / pan(i)yed(i)rêje/: ناو. باڵندەیەکە لە تۆرەمەی بەرگاویلە، لە مێرگ و چیمەن و گۆل و مەرەزجاران دەبینرێت 🇮🇷 پیت پادراز

**پانیەفەرش** / pan(i)yefers/: ناو. سەرپایی ناو ماڵ 🇮🇷 دمپایی روی فرش

**پانیەکێش** / pan(i)yekêş/: ☜ **پاژنەهەڵکێش**

**پانێر** / panêr/: ناو. پارێن؛ پارێنە: ١. گوێلکی پار؛ گوێلپار ‹بە کلک و بە گوێ بە خشە و مشە/ وەک گامێش دەچێ ئەمما پانێرە «حەقیقی»› ٢. *[پلار]* کەر و نەفام 🇮🇷 ١. گوسالەی پارینە ٢. گوساله؛ نفهم

**پاوار** / pawar/: ناو. ڕێبواری داماو 🇮🇷 ابن‌السبیل

**پاوان**[١] / pawan/: ناو. پاون؛ پاوە؛ پاوەن؛ پاوەند؛ مێرگ یا باغی تایبەتی ‹کوێ خۆش بوایە، پاوانی خان بوو› 🇮🇷 قُرُق

**پاوان**[٢]: ئاوەڵناو. قەدەغە؛ قۆرغ ‹هەلە هەڵکەوتووە بۆ کیژ و لاوان/ نییە ئەورۆکە باخی سینە پاوان «هێمن»›. هەروەها: **پاوان بوون؛ پاوان کردن** 🇮🇷 قُرُق

**پاوانخوازی** / pawanx(i)wazî/: ناو. توتالیتاریزم؛ توتالیتاریسم؛ خوازیاری و تەمای بە دەستەوە گرتنی تەواوی هێز و دام و دەزگای دەسەڵات 🇮🇷 تمامیّت خواهی

**پاوانکراو** / pawank(i)raw/: ئاوەڵناو. قۆرخ؛ پاوان 🇮🇷 قُرُق

**پاوانە** / pawane/: ☜ **پامورە**

**پاوپا** / pawpa/: ناو. *[مەجاز]* پاوەپا: ١. دوودڵی؛ گومان ٢. کاری خۆ وەدوا خستن 🇮🇷 ١. گمان؛ تردید ٢. تأخیر

⊡ **پاوپا کردن**: ١. خۆ وەدوا خستن ٢. دوودڵی کردن لە چوونداً 🇮🇷 ١. تأخیر کردن ٢. تردید کردن در عزیمت

**پاوپل** / pawpil/: ناو. ١. پێ‌وپل؛ قاچ و قول؛ لە ئەژنۆ بەرەوخوار ٢. *[مەجاز]* توانایی و کارایی ‹پاوپل کاری وام نییە› 🇮🇷 ١. از زانو به پایین ٢. تاب و توان

**پاوپووز** / pawpûz/: ناو. لە ئەژنۆ بەرەوخوار (بەتایبەت بۆ ژنان) ‹پاوپووز دەڵێی زێڕە/ پاوانەی تێ کراوە «فولکلۆر»› 🇮🇷 ساق و پا

**پاودان** / pawdan/: ناو. دۆخ؛ حالەت ‹کارەکەیان بەجێ هێشت و هەر لەو پاودانەدا ماوە› 🇮🇷 موقعیت

**پاور** / pawir/: ناو. منالّدان 🇮🇷 زهدان

**پاوروا**[١] / pawirwa/: ئاوەڵناو. پاپەتی؛ پێخواس؛ خواس 🇮🇷 پابرهنه

**پاوروا**[٢]: ئاوەڵکار. پێخواس؛ خواس؛ بە پای پەتییەوە 🇮🇷 با پای برهنه

**پاوڕ** / pawiř/: ئاوەڵناو. دابڕاو لە شوێنێ؛ پا لە شوێنێ بڕیاگ ‹نێوانیان شێوا، لەوە بەدوا پاوڕی ماڵیان بووە›. هەروەها: **پاوڕ بوون؛ پاوڕ کردن** 🇮🇷 قطع رابطه شده

**پاوزاخە** / pawzaxe/: ناو. چاوزەقە؛ چاوزاقلە؛ گیایەکی دڕکاوی تیژە لە نێو مەزرادا دەڕوێ 🇮🇷 گیاهی خاردار

**پاوس** / pawis/: ئاوەڵناو. تەمەڵ؛ کەهاڵ 🇮🇷 تنبل

**پاوشا** / pawşa/: ناو. پاشا؛ پاتشا 🇮🇷 پادشاه

**پاوشک** / pawişk, pawişik/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* بەدقەدەم؛ پێ‌ڕەش 🇮🇷 بدقدم

**پاوقام** / pa w qam/: ☜ **پاوقەدەم**

**پاوقەدەم** / pa w qedem/: ناو. پاوقام؛ ودم ≡ شگون

**پاوڵا** / pawła/: ☜ **پاشیل**

**پاومان** / pawman/: ناو. داوێن، لە پشتەوە بەرەوخوار ≡ پشت دامن

**پاوِن** / pawin/: ☜ **پاوان**

**پاونە** / pawne/: ناو. پێوەند؛ کۆتوزنجیر ≡ کند پای زندانی

**پاوە** / pawe/: ☜ **پاوان**

**پاوەپا**[1] / pawepa/: ☜ **پاوپا**

**پاوەپا**[2]: ئاوەڵناو. تاوەتا؛ جێ‌لەجێ؛ پێچەوانە ‹کەوشەکانی پاوەپان!› ≡ جابجا

**پاوەپا**[3]: ئاوەڵکار. تاوەتا؛ بە پێچەوانە ‹کەوشەکانی پاوەپا کردۆتە پای› ≡ لنگەبەلنگە

**پاوەپای** / pawepay/: ئامراز. هاوڕێ؛ هاودەنگ ≡ پا بە پایِ

**پاوەجا** / paweca/: ☜ **پایەدار**

**پاوەجێ** / pawecê/: ئاوەڵناو. ١. جێ‌قایم؛ لەقین بەدوور ٢. بێ گۆڕانکاری ‹بۆ دوو ڕۆژی داهاتوو کەش‌وهەوایەکی ئارام و پاوەجێ بەدی دەکرێ› ≡ ١. استوار ٢. پایدار

**پاوەجێگە** / pawecêge/: ئاوەڵناو. ١. پاوەجێ؛ جێ‌قایم ٢. دانیشتوو ‹پاوەجێگەی لادێ› ≡ ١. مُحکم؛ استوار ٢. ساکن

**پاوەخێر** / pawexêr/: ☜ **قەدەم‌خێر**

**پاوەر** / pawer/: ناو. دەستەبەر؛ زامن ≡ ضامن

**پاوەرە** / pawere/: ناو. ١. دەرپێ؛ ژێرشواڵ ٢. پێڵاو؛ پاپۆش ≡ ١. زیرشلواری ٢. پای‌افزار

**پاوەشانە** / paweşane/: ناو. پاوەشانی؛ دیاری زاوا بۆ بووک بەر لە چوونە پەردە ≡ هدیەی داماد برای عروس قبل از رفتن به حجله

**پاوەشانی** / paweşanî/: ☜ **پاوەشانە**

**پاوەشەڕ** / paweşeř/: ☜ **قەدەم‌شەڕ**

**پاوەمانگ** / pawemang/: ئاوەڵناو. پابەمانگ؛ نۆمانگ؛ سەرحامیلە؛ تایبەتمەندی ژنی دووگیان لە مانگی ئاخری دووگیانیدا ≡ پابەماه

**پاوەن**[1] / pawen/: ناو. ١. ☜ **پاوان** ٢. ☜ **پامورە** ٣. بەند و زنجیری پێ ٤. *[مەجاز]* زیندان؛ بەند ‹ئەگەر بەبێ تۆ بچمە زەماوەن/ حاکم بمگرێ بمخاتە پاوەن «فولکلۆر»› ٥. پوند؛ یەکەی پارەی بریتانیا ≡ ١. ☜ **پاوان** ٢. ☜ **پامورە** ٣. بند پا ۴. زندان ۵. پوند

**پاوەن**[2]: ئاوەڵناو. پابەند؛ پێ‌بەند؛ گیرۆدە ≡ گرفتار

**پاوەند** / pawend/: ناو. ١. ☜ **پاوان** ٢. ☜ **پامورە**

**پاوەنە** / pawene/: ☜ **پامورە**

**پاوەوی** / pawewî/: ☜ **پێخەسو**

**پاوەی** / pawey/: ☜ **پێخەسو**

**پاوەیوە** / paweywe/: ☜ **پێخەسو**

**پاوێنە** / pawêne/: ☜ **پامورە**

**پاهەڵگیر** / pahełgîr/: ناو. بارەبەر ≡ باربر

**پاهەڵەن** / pahełen/: ناو. سەوزە و گیای بەهار ≡ گیاه بهاری

**پای**[1] / pay/: ناو. ١. پەردە ٢. بار؛ بەش؛ دابەش ٣. جۆرێ شیرینی کە میوەشی تێ دەکەن ≡ ١. پرده ٢. قسمت ٣. پای؛ شیرینی میوەای

⊡ **پای کردن**: دابەش کردن ≡ توزیع کردن

**پای**[2]: ئامراز. ١. سەر ‹پای قەولی خۆت بوەستە› ٢. عۆدە؛ لە مل ‹هاتە پای من› ٣. لای؛ لایەنی ‹پای مامەڵە؛ پای شەڕ› ٤. بەرانبەر؛ لە چاو؛ لە پای؛ بە پای ‹پای زۆر شوێنی دی، هەرزانترە› ≡ ١. پایِ ٢. بر عهدەی ٣. طرفِ ۴. در مقایسه با

**پایا** / paya/: ئاوەڵناو. بەردەوام؛ قایم؛ خۆڕاگر ≡ پایا

**پایان** / payan/: ناو. ئاخر؛ کۆتایی؛ دوماهی؛ دوایی ‹ئاخر سەفەرەن ڕا خەیلێ دوورەن/ مەنزل

بێ‌پایان تۆشە زەروورەن «مەولەوی»» ▤ پایان

**پایتخەت** / paytxet/: ☜ **پێتەخت**

**پایتەخت** / paytext/: ☜ **پێتخەت**

**پایدۆزی** / paydozî/: ☜ **پایدۆست**

**پایدۆس** / paydos/: ☜ **پایدۆست**

**پایدۆست** / paydost/: ناو. پایدۆزی؛ پایدۆس؛ دۆخی دەست لە کار هەڵگرتن ▤ عمل دست از کار کشیدن

**پایز** / payiz/: ناو. پاییز؛ پاییژ؛ پەهیز؛ پەیز: ١. سەردوا؛ سەردەوا؛ چری؛ سێهەم کژ لە چوار وەرزی ساڵ ٢. *[کنایە]* خەزان؛ زەردی؛ ئەنگۆرەی پیری و ژاکان ‹پایزی تەمەن› ▤ ١. فصل پاییز ٢. خزان

**پایزە**[1] / payze/: ناو. ١. لە مەقامە کۆنە کوردییەکان ٢. هەڵبەستی ئەو مەقامە ٣. شەختە؛ سەرمای پاییز کە گژ و گیا دەشەمزێنێ ‹گوڵەکەم! باخی دڵم پایزە لێی داوە، برۆ/ تۆ گەشی، هەڵدەپرووکێی، مەیە ئەم ناوە برۆ! «ئاسۆ»› ▤ ١. از آوازهای کهن موسیقی کُردی ٢. شعر آن آواز ٣. سرمای پاییز

**پایزە**[2]: ئاوەڵناو. پایزی؛ پێوەندیدار بە پایزەوە ‹کاوڕە پایزە› ▤ پاییزی

**پایزەبرا** / payzeb(i)ra/: ناو. *[مەجاز]* برایێ کانوونێ؛ دۆستێ کە درەنگ دەیبینی ▤ دوست کم‌پیدا

**پایزەرێز** / payzeřêz/: ناو. شەختە لێداو؛ سەرمابردەی پایز ▤ سرمازدەی پاییزی

**پایزەزا** / payzeza/: ☜ **پایزەزێ**

**پایزەزێ** / payzezê/: ئاوەڵناو. ١. تایبەتمەندی ئاژەڵێ کە لە پاییزدا دەزێ ٢. لە پاییزدا لە دایک بوو ▤ ١. پاییز زاییده ٢. پاییز زاییده شُده

**پایزی** / payzî/: ئاوەڵناو. پاییزە؛ سەر بە پایز ▤ پاییزی

**پایژی** / payjî/: ناو. بژارە؛ شرۆ؛ شرۆڤەی خەو ▤ تعبیر خواب

**پایسکل** / payskil/: هەسپی دارین؛ دووچەرخە ▤ دوچرخه

**پاین** / payin/: چاوگ. پایین؛ چاودێری کردن و ئاگا لێبوون ▤ پاییدن

**پاین**[1] / payn/: ناو. ١. پایین؛ لای خواروو ‹مەلام بێتە سەرینێ/ فەقێم بێتە پاینێ/ بە دەنگێکی پڕ لە سۆز/ بۆم بخوێنن یاسینێ «فولکلۆر»› ٢. جێگەی پێ لە گۆڕدا ▤ ١. پایین ٢. جای پا در قبر

⊡ **پاین کردن**: چەم کردن؛ دێران بە شێوەیەک کە ئاو بە تەواوی دەغڵ داگرێ و لە خوارییەوە دەرچێ ▤ سیراب کردن

**پاین**[2]: ئاوەڵناو. پایین؛ خوارین ▤ پایین

**پایناز** / paynaz/: ناو. پێشواز؛ کاری بەخێر هێنانی گەرم و گوڕ ▤ استقبال گرم (از مهمان)

**پایناو**[1] / paynaw/: ناو. قووناو؛ ئاوێ کە لە ئاو داشتنا لە زەوی دەردەچێ ▤ پساب آبیاری

**پایناو**[2]: ئاوەڵناو. پاراو؛ بەگەشەونەشە؛ تێراوی لە شەوق ▤ شاداب

**پایندە** / payinde/: ئاوەڵناو. پاینە؛ پایەدار؛ خۆڕاگر؛ جێ‌قایم ▤ پاینده

**پاینە** / payne/: ☜ **پایندە**

**پایوان** / paywan/: ناو. پەردەداری پیاوی گەورە ▤ پردەدار

**پایە** / paye/: ناو. ١. بنەڕەت؛ هیم؛ بناغە ‹پایەی دیوار› ٢. پاچکە؛ پێچک؛ ئەستوون؛ ئەستوندەکێ کە شتێکی لە سەر دادەنرێ ‹پایەی مێز› ٣. کۆڵەکە (لە خشت، ئاجۆر یان سمنت) ٤. مەرتەبە؛ پلەوپایە؛ پلە و دەرەجە ‹پایەی زۆر بەرزە› ٥. ڕادە؛ ئەندازە ‹جە دوور وەتەنیت گرانەن دەردم/ سەد پا نە پایەی مەردەن ویەردم «بێسارانی»› ٦. سەرووپێ؛ کەلەپاچە ٧. شێلەگەی بچووک لە

مـەرەزە داشـتندا ▤ ۱تـا۴. پایـە ۵. حـد؛ انـدازە ۶. کلەپاچە ۷. شکافی کە با بیل در کانال شـالیزار ایجـاد کنند

**پایەبەرز** / payeberz/: ئاوەڵـناو. بلندپایە؛ خـاوەن پلە و پایەی بەرز. هەروەها: **پایەبەرزی** ▤ بلندپایە

**پایەدار** / payedar/: ئاوەڵناو. ڕاوەستاو؛ بـەردەوام؛ پاوەجێ؛ پتەو؛ قایم؛ خـۆڕاگر؛ جـێ‌قـایم؛ پـەیت؛ مشوار؛ فرشک؛ خۆگرتوو؛ پاوەجا ▤ پایدار

**پایـەداری** / payedarî/: نـاو. ۱. بـەردەوامی؛ ڕاوەسـتاوی؛ بەرقـەراری؛ دۆخـی هـەرمان ۲. خۆڕاگری؛ سەقام؛ بارودۆخ و چۆنیـەتی نـەگۆڕان ▤ ۱و۲. پایداری

**پایەروڤی** / payeruvî/: ناو. هەوای ئاڵۆز و بە تـەم و دومان ▤ هوای منقلب

**پایەگا** / paye/: ناو. سایت؛ پێگە؛ بنکە ▤ سایت

**پایەماڵ** / payemał/: ئاوەڵناو. پاماڵ ▤ پایمال

**پایەناز** / payenaz/: ☜ **پایەنداز**

**پایەنجە** / payence/: ☜ **پەیژە**

**پایەنـداز** / payendaz/: نـاو. پایـەناز؛ ژێرەخـەر؛ ژێرڕاخەر ‹گوڵ کرا ڕایەخ و پایەندازم/ چەنـدە ئـاژوا لەشی کێو ئاوازم «سوارە»› ▤ پای‌انداز

**پاییز** / payîz/: ☜ **پایز**

**پاییزە** / payîze/: ☜ **پایزی**

**پاییژ** / payîj/: ☜ **پایز**

**پایین** / payîn/: ☜ **پاین**

**پپڵە** / pipłe/: نـاو. پلپلـە؛ زێـرەسـکەی ورد لـە زنجیردا، بۆ خشڵ ▤ زیور آویزە

**پت**[1] / pit/: ناو. ۱. شوار؛ نەبز ۲. بت؛ بوت؛ خـوای دەسکرد ۳. کەپۆ؛ لووت؛ بێفـل؛ دفـن ٤. خـاڵ؛ نوختە ‹چەپکە گوڵێکی وەکوو پتـی خـوێن/ گـوتی ئـای جوانـە، ئـەوە گوڵـی کـوێن؟ «هـێمن»› ٥. خونچەی گیا ٦. پتە؛ پلتۆک؛ کاری بە نینۆک لە شتێک دان ۷. ئەوەندەی سەر پەنجـەی قـامکی گەورە و شادە هەڵیگرێ ‹پتێ دەرمان؛ پتێ چای› ۸. سرکە؛ سرتە؛ پچەپچ ۹. نووک؛ سەری باریکی شت ۱۰. بۆڵە؛ ورتە ▤ ۱. نبض ۲. بُت ۳. بینـی ۴. نقطە ۵. غُنچە ۶. تلنگُر ۷. بار دو انگشت ۸. پچ ـ پـچ ۹. نُک ۱۰. غرولند

**پت**[2]: ئاوەڵناو. شل و سست ▤ شُل؛ سُست

**پت**[3]: دەنگ. فت؛ دەنگێ بە مانای هـیچ، پـووچ ▤ پە

**پت**[4]: ↓

⊡ **پت بون**: دەرکران؛ لە بازنەی بازیدا بەزان ▤ از دور بازی حذف شدن

**پتاپت** / pitapit/: دەنگەناو. سرکە؛ سرتە؛ سـرت و خورت ▤ پچ ـ پچ

**پتات** / pitat/: ئاوەڵناو. زۆرویژ؛ چەنەوەر؛ هەڵەوەڕ؛ چەقەسرۆ؛ زۆربلێ؛ چەنەباز ▤ پُرچانە

**پتپا** / pitpa/: نـاو. نـووکی پەنجـەی پـا ▤ نُـک پنجەی پا

**پت ـ پت** / pit pit/: دەنگەناو. *[مەجاز]* پرتە و بۆڵە ▤ غرولند

**پتپتک** / pitpitik/: ناو. پیرخەنیلە؛ شێوی ساواری ورد ▤ آش بلغور

**پتپتۆک**[1] / pitpitok/: ناو. جۆرێ پەپوولەی خاڵدار ▤ نوعی پروانەی خال‌خالی

**پتپتۆک**[2]: ئاوەڵناو. پنپنۆک؛ پنۆک ـ پنۆک؛ خاڵخاڵی ▤ نقطە ـ نقطە

**پتپتۆکـە** / pitpitoke/: نـاو. گوڵـێکی سـووری سەرەبەهارە ▤ از گل‌های قرمز بهاری

**پتپێس** / pitpês/: ئاوەڵناو. پیس؛ گڵاو؛ چەپەڵ ▤ چرکین

**پتخی** / pitxî/: ئاوەڵـناو. ڕەنـگ‌پـەڕیو؛ بـێ‌ڕەنـگ؛ ڕەنگ‌بزرکاو ▤ رنگ‌پریدە

**پتر**[1] / pitir/: ئاوەڵناو. زۆرتر ‹لە زیادی بێ هەمیشـە بەخت و هاتت/ پتر بێ و هـەر پتـر بـێ دەسـتەڵاتت

«هێمن»› ☰ بیشتر

**پتر**²: ئاوەڵکار. زۆرتـر ‹بـڕۆ مـەجنوون! بـە لـەیلای خۆت مـەنازە!/ کـە ناوبـانگی پتـر ڕۆیـی ئـەوی مـن «هێمن»› ☰ بیشتر

**پتر ـ**³: پێشوشە. پەس؛ پەسە ـ ‹پترپێری› ☰ پس‌ـ

**پترپێری** / p(i)tirpêrî/: نـاو/ ئاوەڵـکار. وارۆزونادورۆزا؛ پەسرپێرەکە ☰ پس‌پریروز

**پتروخە** / pitruxe/: ☜ **پترۆ**

**پترۆ** / pitro/: نـاو. پترۆخـە؛ پتروخـە؛ پترۆکـە؛ پـەترۆک؛ پەترۆکـە؛ قرتماخـەی سـەر بـرین ☰ کبرەی زخم

**پترۆخە** / pitroxe/: ☜ **پترۆ**

**پترۆک** / pitrok/: ناو. پترۆکە؛ پاژێکی زۆر بچووک لە هەویر یان نان ☰ جزء کوچکی از خمیر یا نان

**پترۆکە** / pitroke/: نـاو. ١. ☜ **پتـرۆ** ٢. ☜ **پترۆك**

**پتری** / pitrî/: نـاو. ١. قامـک؛ ئـەنگووس ٢. شەمچە؛ گۆگرد ☰ ١. انگشت ٢. کبریت

**پتک** / pitk/: لێل. ← **پتك‌وپیارزك**

**پتکوپیارزک** / pitk û p(i)yarzik/: ناو. شڕوپڕەی پیرێژنان ☰ کهنه ـ پارەی پیرزنان

**پتکۆ** / pitko/: ئاوەڵناو. خشـپیلانە؛ جـوان؛ زراوی ژیکەڵە ☰ رعنا

**پتکە** / pitke/: ☜ **پتە ـ١**

**پتوپوز** / pit û pûz/: ناو. لچ و لێو؛ دەم‌وپـووز ☰ ذک‌وپوز

**پتورکان** / p(i)turkan/: ☜ **پرتووکان**

**پتورکاندن** / p(i)turkandin/: ☜ **پرتووکاندن**

**پتورکیان** / p(i)turk(i)yan/: ☜ **پرتووکان**

**پتۆ** / p(i)to/: ناو. ژن ☰ زن

**پتوون** / p(i)tûn/: ئاوەڵـکار. تـەواو؛ یـەکجێ؛ بـە تەواوەتی ☰ تمام‌کمال

**پتە** / p(i)te/: ناو. ١. پتکە؛ پت؛ کاری بە قامکێک لێدان ٢. پل؛ پللـە ٣. شـتێکی کـەم لـە جـل و بەرگ ‹پتە و کوتە› ☰ ١. تلنگـر ٢. بشـکن ٣. چنـد تکه لباس

**پتەپت** / p(i)tepit/: نـاو. ١. چۆنیـەتی لـەرزینی گڕی چرا ٢. *(مەجاز)* پرتە و بۆڵە؛ بۆڵـەبۆڵ ☰ ١. سوسوی چراغ ٢. غرولند

**پتەپتە** / p(i)tep(i)te/: ☜ **پەتاتە**

**پتەکـەن** / p(i)teken/: نـاو. تـۆژەر؛ تـۆژەرەوە؛ پەیجۆر؛ کۆڵەرەوە ☰ پژوهشگر

**پتەو** / p(i)tew/: ئاوەڵناو. ١. قایم؛ ڕەختـە؛ سـڕوڕ ‹پێڵاوی پتەو› ٢. ڕاوەستاو؛ بنەجێ؛ گورخ ‹بینای پتەو› ٣. ناوپڕ؛ تۆکمە ‹چێـوی پتـەو› ٤. بـەهێز؛ زۆردار ‹پاڵەوانی پتەو› * هەروەها: **پتەو بوون؛ پتەو کردنەوە** ☰ ١. مُحکم ٢. استوار ٣. توپر ۴. قوی

**پتەوی** / p(i)tewî/: ناو. ڕەقی؛ سفتی؛ سەختی ☰ سختی؛ سِفتی

**پتەی** / p(i)tey/: چاوگ. پێتن؛ کولان؛ کوڵیان ☰ پُختن

**پتیک** / p(i)tîk/: ناو. گەنە؛ مچ؛ گاوەک؛ کـەوگی؛ کەرجـە؛ کـەرژە؛ نـۆژ؛ چنگنـە؛ گەنەکەوڵـە؛ مێرووبەکی چکۆلەیە دەم لە پێستی گیانـەوەران دەنێ و خوێنیان دەمژێ ☰ کنه

**پتیکە** / p(i)tîke/: ☜ **پلتۆك**

**پتیلە** / p(i)tîle/: ناو. پلیتە؛ فتیلە ☰ فتیله

**پتیوار** / p(i)tîwar/: ئاوەڵناو. پامال؛ تەفر و توونا ☰ پایمال

**پتێتە** / p(i)tête/: نـاو. پەتاتـە؛ سـێفەعەرزیلە ☰ سیب‌زمینی

**پچ**¹ / piç/: ناو. ١. پێچ ٢. سرتە؛ سرکە ☰ ١. پـیچ ٢. پچ ـ پچ

**پچ**²: ئاوەڵناو. کەم؛ هندک ☰ اندک

**پچانن** / p(i)çanin/: چاوگ. سرتە کردن؛ پچەپچ کردن ☰ در گوشی حرف زدن؛ پچ ـ پچ کردن

**پچرک** / p(i)çirk/: ناو. جۆرێ کولێرە ☰ نوعی گردەنان

**- پچڕ** / piçiř-/: پاشەوشە. ١. ـ پچڕاو؛ ئەوەی ئەپچڕێ ‹زووپچڕ› ٢. ـ پچڕین ‹پەتپچڕ› ☰ ١و٢. ـ گُسل

**پچڕان** / piçřan, piç(i)řan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //پچڕای؛ دەپچڕی؛ بپچڕە// پسان؛ قرتیان؛ قەتیان؛ لە بەر یەک چوون ‹لە یەک پچڕاوە زەنجیری مەواسیق/ عوهوود و وعدە و پەیمان نەماوە «سەید تاهیر هاشمی»› ☰ گُسیختن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: پچڕاو/ چاوگی نەرێنی: نەپچڕان

**پچڕاندن** / piç(i)řandin/: چاوگ. تێپەڕ. //پچڕاندت؛ دەپچڕێنی؛ بپچڕێنە// قرتاندن؛ پساندن ‹ئەو شۆخە کە چەفیەی لە سەر و گەردنی ئالاند/ ڕیشەی دڵی عوششاقی بە ڕیشووی ڕەشی پچڕاند «بێخود»› ☰ گسلانیدن؛ گسستن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپچڕاندن

**پچڕاندنەوە** / piç(i)řand(i)newe/: چاوگ. تێپەڕ. //پچڕاندتەوە؛ دەپچڕێنیەوە؛ بپچڕێنەوە// ١. دووبارە پساندن ٢. دڕاندنی شتی تەنراو وەک بەرگی دژ لە شەڕدا ☰ ١. باز گسلاندن ٢. جر دادن لباس کسی

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـــ/ چاوگی نەرێنی: نەپچڕاندنەوە

**پچڕانن** / piç(i)řanin/: چاوگ. پچڕاندن ☰ گُسلاندن

**پچڕانەوە** / piç(i)řanewe/: چاوگ. تێنەپەڕ. //پچڕایەوە؛ دەپچڕیەوە؛ بپچڕێوە// دیسان پسانەوە ☰ دوبارە گُسستن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: پچڕاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەپچڕانەوە

**پچڕاو** / piç(i)řaw/: ئاوەڵناو. پساو؛ قەتای؛ قرتاو؛ قرتیاگ ☰ پارە؛ گُسستە

**پچڕ، پچڕ**[1] / piçiř piçiř/: ئاوەڵناو. کوت‌ـکوت ☰ پارە ـ پارە

**پچڕ ـ پچڕ**[2]: ئاوەڵکار. ١. پس‌ـپس؛ پساو ٢. بەش‌بەشی؛ کەم‌ـکەم ☰ ١. گُسستە ٢. پارە ـ پارە

**پچڕۆک** / piç(i)řok/: ئاوەڵناو. لە پسان نزیک ☰ قابل گُسستن

**پچڕیاگ** / piçiřyag/: ئاوەڵناو. پچڕاو؛ قرتیاگ ☰ گُسستە

**پچڕیان** / p(i)çiřyan/: چاوگ. پچڕان؛ قرتیان ☰ گُسستن

**پچڕین** / piç(i)řîn/: چاوگ. ١. پساندن ‹وە دووی دڵ کەوت و پچڕی بەند و پێوەند/ دڵی خۆی دا بە لاوێکی هونەرمەند «هێمن»› ٢. بردن؛ دەست کەوتن ‹بەشی خۆی پچڕی› ☰ ١. گُسیختن ٢. بُردن؛ (بە) چنگ آوردن

**پچڕینەوە** / piç(i)řînewe/: چاوگ. [مەجاز] ١. لێک بڕان/ بڕیان ٢. لە شەڕدا بەرگی یەکتر بە چنگ دڕاندن ☰ ١. قطع علاقە و ارتباط ٢. (بر)دریدن

**- پچڕێن** / piç(i)řên-/: پاشەوشە. ـــ قرتێن ☰ گُسلندە

**پچکان** / piçkan/: چاوگ. ڕزان؛ پوان ☰ پوسیدن

**پچکاندن** / piçkandin/: چاوگ. کەم کردنەوە ☰ کاستن

**پچکڕان** / piçikřan/: ☜ پچەڕان

**پچکڕاندن** / piçikřandin/: ☜ پچەڕاندن

**پچکڕین** / piçkiřîn/: ☜ پچەڕان

**پچکۆڵ** / piçkoł/: ئاوەڵناو. چکۆڵە ☰ کوچولو

**پچکۆڵانە** / piçkołane/: ئاوەڵناو. چکۆڵانە؛ پچکۆڵ ☰ کوچولو

**پچکەڵانە** / piçkełane/: ئاوەڵناو. چکۆڵانە؛ پچکۆڵ ☰ کوچولو

**پچکەڵە** / piçkełe/: ئاوەڵناو. چکۆڵانە؛ پچکۆڵ ☰

کوچولو

**پچکین / piçkîn/**: چاوگ. کەم بوونـەوە ⊑ کاستـە شدن

**پچمە / piçme/**: نـاو. پچـە؛ تەویلـە؛ تەوێڵـە ⊑ اصطبل

**پچـۆز / piçoz/**: نـاو. ١. خواحـافیزی ٢. ژنی بێشەرم ⊑ ١. خداحافظی ٢. زن بی‌حیا

**پچـوک / p(i)çûk/**: ناوەڵناو. ١. چکۆڵـە؛ گچکـە؛ بووچکەلـە ٢. *[مەجاز]* بەردەسـت؛ خزمـەتکار ٣. *[مەجاز]* ژێردەسـت ⊑ ١. کوچـک ٢. خـدمتکار ٣. زیردست

◘ **پچوک بون**: *[مەجاز]* ژێردەست بوون ⊑ خدمتکار بودن

**پچوک بونەوە** کەم بوونەوە؛ داشکان ⊑ کوچک شدن؛ کاستن

**پچوک کردنەوە** کـەم کردنـەوە؛ داشـکاندن ⊑ کوچک کردن؛ کاستن

**پچوکی / p(i)çûkî/**: ناو. ١. بووچکی؛ چکۆڵـەیی؛ گچکەیی ٢. *[مەجاز]* خزمـەتکاری؛ نۆکـەری ⊑ ١. کوچکی ٢. نوکری

**پچە / p(i)çe/**: ناو. ١. سرتە؛ سرکە ٢. ☜ **پچمە** ⊑ ١. پچ ـ پچ ٢. ☜ **پچمە**

**پچە پچ / p(i)çepiç/**: ناو. پچە؛ سرتە ⊑ پچ‌پچ

**پچەڕان / p(i)çeřan/**: چاوگ. پچکڕان؛ پچکـڕین؛ پچڕان؛ پرووچکان؛ پرووچکین ⊑ گُسستن

**پچەڕانـدن / p(i)çeřandin/**: چـاوگ. پچکڕانـدن؛ پچڕاندن؛ پرووچکاندن ⊑ گُسلاندن

**پچیـان / piçyan/**: چـاوگ. پـێچ خـواردن؛ لـوول خواردن ⊑ پیچیدن

**پچیـای / piçyay/**: چاوگ. پێژران؛ کران (بـۆ نـان) ⊑ پخته شدن

**پچین / piçîn/**: چاوگ. شەق تـێ‌هەڵـدان ⊑ تیپا زدن

**پچیەی / piçyey/**: چاوگ. پێژران ⊑ پخته شدن

**پخ / pix/**: دەنگەناو. ١. پخک؛ وشـەی ترسـاندنی بە گاڵتە ٢. *[مندالانە]* سەر بڕین و خنکانـدن ⊑ ١. پخ؛ واژەی ترساندن به شوخی ٢. سر بُریدن

◘ **پخ کردن** ١. دەنگی پـخ دەرهێنـان ٢. *[کینایە]* سەر بڕین ‹کەسێ قسە بکا، پخی ئەکەن!› ⊑ ١. پخ کردن ٢. سر بُریدن

**پخ لێکردن** داچڵەکاندن ‹پخێکم لێکرد وەخـت بوو دڵی بتۆقێ!› ⊑ شوکه کردن

**پختـۆک / pixtok/**: ناو. هەلان؛ خام؛ بەردی تەخت و لووس ⊑ سنگ تخت و صاف

**پخک / pixik/**: دەنگەناو. پخ؛ وشەی ترساندنی بـە گاڵتە ⊑ پخ

**پخین / pixîn/**: چـاوگ. پرخانـدن؛ پرخـانن ⊑ خروپُف کردن

**پدو / pidû/**: ناو. پدی؛ پودوو؛ پۆ؛ پەوو؛ پی؛ پیوو؛ پێ؛ پووک؛ گۆشتی بن ددان ⊑ لثه

**پدی / pidî/**: ☜ **پدو**

**پر / pir/**: ☜ **پرد[1]ـ١**

**پـراخ / pirax/**: نـاو. یـاپراخ؛ ئـاپراخ؛ دۆڵـمەی گەڵامێو ⊑ دلمەی برگ مو

**پراسـیئۆدیمیوم / p(i)rasê'odîmyum/**: نـاو. توخمی کیمیایی کانزایی دەگمەن لـە دەسـتەی لانتانیـدەکان بـە ژمـارە ئـەتومی ٥٩ و کێشـی ئـەتومی ١٤٠,٩٠، سـپی ئامـاڵ زەردە کـە بـۆ دروست کردنی شیشەی ڕەنگـی بـە کـار دێ ⊑ پراسئودیمیم

**پراش / p(i)raş/**: ناو. وردە؛ ورتکـە ‹پراشـی نـان؛ پراشە چێو› ⊑ ریزه

**پراش پراش / p(i)raşp(i)raş/**: ناوەڵناو. لەتـلـەت؛ ورد و خاش ⊑ ریز-ریز

**پراو / p(i)raw/**: ☜ **پلاو**

**پراوە / p(i)rawe/**: ☜ **پرۆ**

**پرپره** / pirp(i)re/: ناو. ۱. پووله‌که؛ بریقه؛ ئۆییه ۲. پەرەنگی گواره ۳. پرپریک؛ پەلپینه ☰ ۱. پولک ۲. آویزەی گوشواره ۳. گیاه خُرفه

**پرپریک** / pirp(i)rîk/: ناو. ۱. پرپره؛ پەلپینه ۲. پەپووله ☰ ۱. گیاه خُرفه ۲. پروانه

**پرپلیک** / pirp(i)lîk/: ناو. پرپره؛ پەلپینه ☰ گیاه خُرفه

**پرپۆڵ**[1] / pirpoł/: ناو. کۆنەپەڕۆ؛ پارچەی کۆنی دڕاو ☰ کهنه پارچه

**پرپۆڵ**[2]: ئاوەڵناو. *[پلار]* سست؛ شل؛ ناقایم؛ خۆنەگر ☰ شُل

**پرپۆڵە** / pirpołe/: ناو. پرپۆڵە: ۱. چێشتی گزمووڵەی هەویر و کووزەڵە ۲. خواردنی جووچکە مریشکی تازە لە هێلکە دەرهاتوو ☰ ۱. اوماج ۲. زواله

**پرپە** / pirpe/: ناو. هەزارپێ؛ پڕپا ☰ هزارپا

**پرت** / pirt/: ناو. پارچۆکە؛ کلۆی چووک ☰ کلوخک

**پرتافیان** / pirtafyan/: چاوگ. تاو دان؛ تونـد غاردان ☰ تاختن

**پرتافێن** / pirtafên/: ناو. گرێوە غار ☰ مسابقەی اسبدوانی

**پرتاڵ** / pirtał/: ناو. ۱. لیباس؛ جلوبەرگ ‹پرتاڵ پیایەل ئیلام› ۲. کەلوپەلی ناوماڵ ☰ ۱. لباس ۲. اثاثیەی خانه

**پرتاندن** / pirtandin/: چاوگ. ۱. بڕین؛ قرتاندن ۲. فلتاندن؛ قسەی بێمانا گوتن ۳. بۆڵەبۆڵ کردن؛ لەبەر خۆوە بۆلاندن ☰ ۱. بُریدن ۲. یاوه گفتن ۳. لندیدن

**پرتک** / pirtik/: ناو. پرت؛ بەشێکی زۆر کەم لە شتێکی زۆر ☰ ریزه

**پرتکاندن** / pirtikandin/: چاوگ. ۱. ورد کردن؛ بەش ـ بەش و لەت ـ لەت کردن ۲. ڕنینەوە؛ بڕینەوەی ڕووەکی کێڵگە یان ئالفجاڕێک ☰ ۱. ریزه ـ ریزه کردن ۲. درو کردن

**پرتکە** / pirtke/: ناو. پرتک؛ وردە؛ کەمووکە ☰ ریزه

**پرتکە ـ پرتکە** / pirtke pirtke/: ناو. چکە ـ چکە؛ کەمە ـ کەمە ☰ بُریده ـ بُریده

**پرتکیان** / pirtikyan/: چاوگ. پرتووکان؛ پوان ☰ فرسودن

**پرتکین** / pirtikîn/: چاوگ. پرچکین؛ ڕنرانەوە ☰ درو شدن

**پرتنای** / pirtnay/: چاوگ. *[پلار]* دافرتانن؛ خستنەوە ☰ پس انداختن

**پرتوک**[1] / pirtûk/: ناو. پرتکە؛ کوتەپارچە ☰ تکه پارچه

**پرتوک**[2]: ئاوەڵناو. ڕزیو؛ ڕزی ☰ پوسیده

**پرتوکان** / pirtûkan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //پرتووکای؛ دەپرتووکێ؛ بپرتووکێ// پتورکان؛ پتورکیان؛ پرتووکیان؛ پۆزنکان؛ ڕزین؛ لەبەر یەک چوون ☰ پوسیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپرتووکان

**پرتوکاندن** / pirtûkandin/: چاوگ. تێپەڕ. //پرتووکاندت؛ دەپرتووکێنی؛ بپرتووکێنە// پتورکاندن؛ داڕزاندن ☰ فرسوده کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپرتووکاندن

**پرتوکاو** / pirtûkaw/: ئاوەڵناو. ڕزیو؛ لەبەر یەک چووگ ‹لێفەی کۆنەی داڕزیو/ پرتووکاوی خوابڕیو! «قانع»› ☰ پوسیده

**پرتوکی** / pirtûkî/: ناو. گەللایی؛ بەرەڵایی؛ بێسەرەوبەرەیی ☰ بی‌بندوباری

**پرتوکیاگ** / pirtûkyag/: ئاوەڵناو. ڕزیو؛ ڕزی؛ لەبەریەک چووگ ☰ پوسیده؛ فرسوده

**پرتوکیان** / pirtûkyan/: چاوگ. ڕزین؛ لەبەریەک

چوون 🇮🇷 پوسیدن

**پرته** / pirte/: ناو. ١. نەبز؛ پەت؛ شەوار ٢.ترووکەی گڕی مۆم و چرا ٣. بۆڵەی بن لێوان ٤. پرتک؛ کوتی چکۆلە 🇮🇷 ١. نبض ٢. پت ـ پت شعلەی شمع و چراغ ٣. غرولند ۴. تکّه

**پرتەپرت** / pirtepirt/: ناو. ١. پرتەی زۆر ٢. ترووکەترووکی گڕی چرا 🇮🇷 ١. غرولند ٢. پت ـ پت شعلەی چراغ

**پرتەقاڵ** / pirteqał/: ناو. ١. فلتەقان؛ دارێکە لە تیرەی مزرەمەنی، تایبەتی ناوچە شێدارەکان، بە گەڵای هەمیشە شین و گوڵی پێنجبەشی بۆنخۆشەوە ٢. میوەی ئەو دارە کە تۆپن، ئاودار و ترش و شیرینە و توێکڵی نارنجی و گرنجدارە 🇮🇷 ١. درخت پرتقال ٢. میوەی پرتقال

**پرتەقاڵی**[1] / pirteqałî/: ناو. ڕەنگی زەردی ئامال سوور؛ ڕەنگی پرتەقال 🇮🇷 رنگ پرتقالی

**پرتەقاڵی**[2]: ئاوەڵناو. ١. بە ڕەنگی زەردی ئامال سوور؛ بە ڕەنگی پرتەقاڵ ٢. بە تام و چێژی پرتەقاڵ 🇮🇷 ١. به رنگ پرتقال ٢. با مزەی پرتقال

**پرتەقاندن** / pirteqandin/: چاوگ. فلیقاندنەوە؛ تلێقاندنەوە 🇮🇷 له کردن

**پرتەکەر** / pirteker/: ئاوەڵناو. خوتن؛ بە بۆڵەبۆڵ 🇮🇷 غُرغُرو

**پرتەوبۆڵە** / pirtewbołe/: چاوگ. پرتەپرت؛ بۆڵەی زۆر ‹دایەخانم دەوری چۆڵە/ لێم کەوتۆتە پرتەوبۆڵە «هێمن»› 🇮🇷 غُرغُر

**پرچ** / pirç/: ناو. ١. کەزی؛ مووی درێژی سەر ٢. پەڕی باڵندە ٣. مووی لەش 🇮🇷 ١. گیس؛ زُلف ٢. پر پرنده ٣. موی بدن

**پرچان** / pirçan/: چاوگ. پچەڕان؛ بران؛ قرتان 🇮🇷 گُسستن

**پرچاندن** / pirçandin/: چاوگ. پچەڕاندن؛ بڕین؛ قرتاندن 🇮🇷 گُسیختن

**پرچقان** / pirçiqan/: چاوگ. فلیقانەوە؛ تلێقانەوە 🇮🇷 له شدن

**پرچقاندن** / pirçiqandin/: چاوگ. فلیقاندنەوە؛ تلێقاندنەوە 🇮🇷 له کردن

**پرچک** / pirçik/: ناو. پریشکی ئاوی بە کوڵ 🇮🇷 قطرات آب جوش

**پرچکان** / pirçikan/: چاوگ. ڕنرانەوە؛ کنیانەوە 🇮🇷 کنده شدن

**پرچکین** / pirç(i)kîn/: ☜ **پرتکین**

**پرچگ و پلار** / pirçig û p(i)lar/: ناو. تیر و تانە؛ تەشەر 🇮🇷 طعنه و سرزنش

**پرچن** / pirçin/: ئاوەڵناو. ١. خاوەن پرچ ٢. تایبەتمەندی مووی تێکەڵاوی پڕی شانەنەکراو 🇮🇷 ١. کاکُل‌دار ٢. ژولیدەمو

**پرچوم** / pirçum/: ناو. کزوولکە و دڵتەنگ 🇮🇷 افسُردە

**پرچۆک** / pirçok/: ناو. قەڵەموو 🇮🇷 قلم‌مو

**پرچە** / pirçe/: ناو. ترووسکە؛ شەبەق 🇮🇷 درخشش

**پرچەماتێ** / pirçematê/: ناو. کار و ڕەوتی درەوشانەوە 🇮🇷 درخشش

**پرچەمێک** / pirçemêk/: ناو. چەکچەکی؛ شەمشەمەکوێرە 🇮🇷 خفاش

**پرچی** / pirçî/: ئاوەڵناو. گیست؛ برسی؛ نێز 🇮🇷 گُرسنه

**پرچی‌ئایشەوفاتمان** / pirçî 'ayşewfat(i)man/: ناو. کۆلکەزێڕینە؛ پەلکەزێڕینە؛ کەسکەسوور 🇮🇷 رنگین‌کمان

**پرخ** / pirx/: ☜ **پرخە**

**پرخاندن** / pirxandin/: چاوگ. تێپەڕ. //پرخاندت؛ دەپرخێنی؛ بپرخێنە// پرخانن؛ پرخە کردن لە خەودا ‹ساوای ناو جۆلانەی ژێردار/ ئەیپرخان وەک بەرخی بەهار «گۆران»› 🇮🇷 خُرناسه کشیدن؛ خُروپف کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپرخاندن

**پرخانن** / pirxanin/: ☜ **پرخاندن**

**پرخن** / pirxin/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی کەسێ کە لە خەودا بپرخێنێ ⚏ دارای خروپف

**پرخنای** / pirx(i)nay/: چاوگ. پرخاندن ⚏ خُرناس کشیدن

**پرخوهۆڕ** / pirx û hoř/: ناو. پرخەی زۆر و بەهێز ⚏ خُرناسەی متوالی

**پرخە** / pirxe/: دەنگەناو. پرخ؛ دەنگی کەپۆی خەولێکەوتوو ⚏ خُرناسە؛ خُروپف

⊡ **پرخە لێبەرزەوە بوون**: /کنایە/ خەوی قورس لێکەوتن ‹هەر ڕاکشا، پرخەی لێبەرزەوە بووا› ⚏ بە خواب عمیق رفتن

**پرخەپرخ** / pirxepirx/: دەنگەناو. پرخەی زۆر ⚏ خروپف مُداوم

**پرخەکەر** / pirxeker/: ئاوەڵناو. مرخن؛ مرخنە ⚏ خُرخُرو

**پرد**[1] / pird/: ناو. ١. پر؛ پێل؛ پەل؛ پل؛ پردی؛ پردەباز؛ کلکە؛ هۆی پێوەندی نێوان دوو شتی دابڕاو ٢. حاڵەتێک لە وەرزشی ژیمناستیک و زۆرەبانێدا کە وەرزشکار بە پشتدا و لە بان دەست و پێ یان سەر و پێوە خۆی ڕادەگرێ ⚏ ١. پُل ٢. پُل (ورزش)

**پرد**[2]: پێرۆ. ← **ورد و پرد**

**پرد و پێناو** / pird û pênaw/: ناو. هۆی پەرینەوە لە بەڵا و چۆرتم ‹یا خوا ئەگەر سەبەبکاری من تۆ بی، بە پرد و پێناوم بی «مەسەل»› ⚏ سبب خیر

**پردۆکە** / pirdoke/: ناو. پرک؛ پردەڵە ⚏ پُل کوچک

**پردو** / pirdû/: ناو. ١. جۆرێ کاڵەک ٢. ☜ **پەردو** ⚏ ١. نوعی خربزە ٢. ☜ **پەردو**

**پردوخیاگ** / pirdûxyag/: ئاوەڵناو. هەڵپرووزاو؛ پرووزیاگ ⚏ سوختە (پشم و مو)

**پردوخیان** / pirdûxyan/: چاوگ. هەڵپرووزان؛ پرووزیان ⚏ سوختن (پشم و مو)

**پردە** / pirde/: پێرۆ. ← **وردە و پردە**

**پردەباز** / pirdebaz/: ناو. پردی پێدا ڕۆیشتن ‹هیچ دوور نەڕۆین تازە ـ تازە/ ئەم کوردە سەر پردەبازە «هەژار، بۆ کوردستان»› ⚏ پُل عبور

**پردەڵە** / pirdełe/: ناو. ١. ئامرازێک لە ئاشدا ٢. کەرستەیەکی جۆلایی ٣. پردی گچکە ⚏ ١. ابزاری در آسیاب ٢. ابزاری در جولایی ٣. پُل کوچک

**پردەوان** / pirdewan/: ناو. ئەوی پارێزەری پردە ⚏ نگهبان پُل

**پردی** / pirdî/: ☜ **پرد**[1]

**پرز** / pirz/: ☜ **پرووش**[1]

**پرزانک** / pirzanik/: ناو. دوگمە؛ دگمە؛ قۆپچە ⚏ دُکمە؛ تُکمە

**پرزانگ** / pirzang/: ناو. مناڵدان؛ زێدان؛ زێ ⚏ زهدان

**پرزانەوە** / pirzanewe/: چاوگ. دەڵان؛ دەڵین؛ دیلان ⚏ تراویدن

**پرزک** / pirzik/: ناو. پرسک؛ زیپکە ⚏ جوش

**پرزۆڵ** / pirzoł/: ناو. ١. پرزۆڵە؛ تیتۆڵ؛ بزگوڕ ٢. شتی زۆر ورد و بێبایەخ ⚏ ١. کهنەی تکەپارە ٢. هر چیز ریز بی‌ارزش

**پرزۆڵ ـ پرزۆڵ** / pirzoł pirzoł/: ئاوەڵناو. بزگوڕ ـ بزگوڕ ⚏ ریزە ـ ریزە

**پرزۆڵە** / pirzołe/: ☜ **پرزۆڵ**

**پرزە** / pirze/: ناو. ١. قەسەڵ؛ بەرماوی ئالف لە ئاخوڕدا ‹گوڵاڵە و سوێسنە و خاو و کەنێرە/ هەموو پرزەن، زەمان کردوونی گێرە «هێمن»› ٢. پووش یا لەتە قامیشی باریک ٣. کاری فرکاندن؛ هەڵپریواندن؛ پرواندن؛ ڕێخستنی جلی قوڕاوی تا قوڕەکەی لێهەڵوەرێ ٤. هێز و تاقەت ‹پرزەم لێبراوە› ٥. وردیلە؛ قرتە؛ قردگ ⚏ ١. پسماندەی

آخور ۲. پوشال باریک نی و ـ ۳. کار گـل و خـاک از لباس گرفتن ۴. رمق؛ توان ۵. ذرّە

◘ **پرزە برین**: ۱. هیچ نەهێشتن؛ پـاک لـە پـاکی خواردن و هیچ نەهێشتن ‹چی هاتە بانی سفرە، هەمووی خوارد، پـرزەی لـێ بـڕی!› ۲. بـێهێـز کردن؛ هێز لێبڕین ‹هەژار لە پەنـدی بێسـوود چتە لەگەڵ نەزانان؟/ نازانی ئێستە ناحەق پـرزەی حەقی بڕیوە؟ «هەژار، *بۆ کوردستان*»› 🇮🇷 ۱. همـە را خوردن و چیزی باقی نگذاشـتن ۲. از تـک و تـا انداختن

**پرزە لێبڕان**: ماندوو بـوون؛ هێـز لـێبـڕان 🇮🇷 از رمق افتادن

**پرزە لێ بڕین**: هێز و هاز لـێ سـەندن ‹منـیش زۆرداریی پرزەی لێ بڕیوم/ منیش بەدکاریی بواری لێ تەنیوم «هێمن»› 🇮🇷 از تک و تا انداختن

**پرزەکـوت** / pirzekut/: ناوەڵـناو. بـێهن‌تـەنگ؛ بێتاقەت 🇮🇷 ناشکیبا

**پرژ** / pirj/: ناوەڵناو. بڵاو؛ پەرش 🇮🇷 پراکنده

**پـرژان** / pirjan/: چاوگ. تێنەپەر. //پرژای؛ دەپرژێـی؛ بپرژە// ۱. پژان؛ پژیان ۲. ڕژان؛ ڕژیان 🇮🇷 ۱. پخش شدن ۲. ریختە شدن

■ ناوەڵـناوی بـەرکاری: پـرژاو/ چـاوگی نـەرێنی: نەپرژان

**پرژانـدن** / pirjandin/: چـاوگ. تێـپەر. //پـرژای؛ دەپرژێی؛ بپرژە// ۱. پژاندن ۲. ڕژتـن 🇮🇷 ۱. پخـش کردن ۲. ریختن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپرژاندن

**پرژاو** / pirjaw/: ☜ پەخش

**پرژ و بڵاو** / pirj û b(i)ław/: ناوەڵـناو. پـەرژوبڵاو؛ پرش‌وبڵاو؛ پەخش و پەرێشان 🇮🇷 پخش‌وپلا

**پرژۆڵ** / pirjoł/: ناو. پرژ 🇮🇷 افشان

**پرژە** / pirje/: نـاو. پرشە؛ چیلکە و چێڵی ناسـک و تەڕ ‹دوو بار پرژەم هێناوە› 🇮🇷 خس و خاشاک نازک و تر

• **پرژێن** / pirjên-/: ☜ ـ پرژێن

**پرس**[1] / pirs/: ناو. ۱. پرسیار؛ وتـەیێ کـە جـوابی گەرەکە. هەروەها: **پرس کردن** ۲. *[مەجاز]* ڕاوێـژ؛ تـەگبیر. هـەروەها: **پـرس پـێ کـردن** ۳. کێشـە؛ چـەمک؛ بابـەتێ کـە پێویسـتی بـە گـەڕان و لێکۆڵـینەوە و ڕێچـارە بـێ ‹پرسـی بێکـاری› ٤. تەوەر؛ پرسیارێکی دژوار کـە بـێوەڵام ماوەتـەوە ‹پرسـی سەرهەڵـدانی جیهـان› 🇮🇷 ۱. پُرسـش ۲. مشورت ۳. مُعضل ۴. مسئلە

**ـ پـرس**[2]: پاشەوشـە. ئـەوی دەپرسـێ ‹داوپـرس؛ بەرپرس› 🇮🇷 ـ پُرس

**پرسا** / pirsa/: ناو. پرسکەر؛ بە پرسیار 🇮🇷 پُرسشگر

**پرسانە** / pirsane/: ناو. ۱. دیاری بۆ ماڵی تازیەبار ۲. پرسە؛ تازیەباری 🇮🇷 ۱. همیاری با صاحب عزا ۲. عزاداری

**پرساوپرس** / pirsawpirs/: ناوەڵـکار. نوونـەنوون؛ پرسێن‌ـ پرسێن؛ بە لەم و لەو پرسێن ‹پرساوپرس ماڵەکەتانم دۆزییەوە› 🇮🇷 پُرسان ـ پُرسان

**پرسـران** / pirs(i)ran/: چاوگ. تێنەپەر. تادیار. //ـ؛ دەپرسێری؛ بپرسێرێ// پرسیار کران ‹پرسراو حاڵم، کە من کەوتم لە بەر پێیا درێژ/ ئەو وتی هەر سێبەری دیوم، بووە سەرسـام و گێـژ «مـەحوی»› 🇮🇷 پرسـیدە شدن

■ ناوەڵـناوی بـەرکاری: پرسـراو/ چـاوگی نـەرێنی: نەپرسران

**پرسک** / pirsik/: نـاو. زیپکە؛ جۆشی سـەروروو 🇮🇷 جوش صورت

**پرسکار** / pirskar/: ناو. ئەو کەسە لەمەڕ بابەتێکی تایبەتەوە لە تاقمێ خەڵک پرسیار دەکا ‹پرسکار، ئەم پرسیارەی لە چەن کەسی تر پرسی› 🇮🇷 پُرسشگر

**پرسکەر** / pirsker/: ☜ پرسا

**پرسگە** / pirsge/: نـاو. شوێنی پرسـیار کـردن لـە

دایرە و دامەزراوەکان 🇮🇷 اطلاعات (ادارات)

**پرسنامە** / pirsname/: ناو. نووسراوەیەک بە پرسیاری جۆراوجۆرەوە بۆ وەڵام دانەوە 🇮🇷 پُرسشنامە

**پرسوجۆ** / pirs û co/: ناو. کار و ڕەوتی ڤیکەتن؛ پرس و لێکۆڵینەوە بۆ وەرگرتنی زانیاری یان دەرخستنی هەڵە و ڕاستی بابەتێک 🇮🇷 پُرس‌وجو

**پرس‌وڕا** / pirs û řa/: ناو. پرس و مەسلەحەت؛ کار و ڕەوتی پرس کردن و ڕا و بۆچوونی کەسانی تر بیستن 🇮🇷 مشورت

**پرسۆک** / pirsok/: ئاوەڵناو. زۆر پرسیارکەر 🇮🇷 بسیار پُرسشگر

**پرسە** / pirse/: ناو. پەرسە: ١. پرسانە؛ تازیە؛ ئازیەت ٢. ڕێوڕەسمی سەرەخۆشی ٣. کاری دیدار کردن لە نەخۆش 🇮🇷 ١. عزاداری ٢. مراسم ختم ٣. عیادت بیمار

**پرسە ـ پرسە** / pirse pirse/: ئاوەڵکار. پرساوپرس 🇮🇷 پُرسان ـ پُرسان

**پرسەخەسو** / pirsexesû/: ناو. هەواڵپرسی نە بەڕاستی و سەرزارەکی 🇮🇷 احوالپرسی سرسری

**پرسەک** / pirsek/: ناو. نیشانەی پرسیار (؟) 🇮🇷 علامت سوآل (؟)

**پرسەکەر** / pirseker/: ناو. ئەوانەی بۆ سەرەخۆشی دەچن ‹پرسەکەر گەڕانەوە› 🇮🇷 شرکت کنندگان در مراسم ترحیم

**پرسەگورگانە** / pirsegurgane/: ناو. پرسەگورگانێ؛ پرس پێ‌کردنی ڕواڵەتی و بە قسە نەکردن 🇮🇷 نظرخواهی تعارُفی

**پرسەگورگانێ**/ pirsegurganê/: ☜ **پرسەگورگانە**

ـ **پرسی** / pirsî-/: پاشگر. ـ پەرسی؛ کاری پرسین ‹ڕاپرسی› 🇮🇷 ـ پُرسی

**پرسیار** / pirs(i)yar/: ناو. پرس؛ پسیار 🇮🇷 پُرسش

**پرسیارنامە** / pirsyarname/: ناو. فۆرم 🇮🇷 فُرم

**پرسین** / pirsîn/: چاوگ. تێپەڕ. //پرسیت؛ دەپرسی؛ بپرسە// ١. پرس کردن ‹گەر دەپرسی من لە بەر چی کەم دەخۆم/ من بە برسی قەت مەزانە، غەم دەخۆم «نالی»› ٢. چاک‌وخۆشی کردن؛ لە حاڵ و ژیواری کەسێ پرسینەوە ‹کەس لێمان ناپرسێ› 🇮🇷 ١. پُرسیدن ٢. احوالپرسی کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: پرسیاو/ چاوگی نەرێنی: نەپرسین

**پرسینەوە** / pirsînewe/: چاوگ. تێپەڕ. //پرسیتەوە؛ دەپرسییەوە؛ بپرسەوە// ١. بە سەر کردنەوە ٢. سەرحیساب بوون؛ بە حیساباندا چوونەوە ٣. دیسان پرسین 🇮🇷 ١. رسیدگی کردن ٢. حسابرسی کردن ٣. باز پُرسیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپرسینەوە

**پرش** / pirş/: ناو. هەناسە؛ هناسە 🇮🇷 نفس

**پرشنگ** / pirşing/: ناو. پڕشنگ: ١. تیرێژ؛ تیرۆژ؛ تیشکی ڕۆژ؛ تیشک ‹عەکسی سەوزایی ڕووی پڕ لەرەی ئاو/ تیا ئەشکاوە پرشنگی هەتاو «گۆران»› ٢. پزیسک؛ پریشکەی ئاگر 🇮🇷 ١. تابش ٢. شرارە

**پرشنگدار** / pirşingdar/: ئاوەڵناو. خاوەن‌پرشنگ؛ تیشک‌هاوێژ 🇮🇷 تابان

**پرش و بڵاو** / pirş û b(i)ław/: ☜ **پرژ و بڵاو**

**پرشە** / pirşe/: ناو. ١. ورشە؛ گرشە ‹پرشەی ڕووی دەرکەوت شای سۆسەن خالان/ کەم کەم لە گۆشەی لای سیامالان «پیرەمێرد»› ٢. ☜ **پرژە** 🇮🇷 ١. درخشش ٢. ☜ **پرژە**

**پرک**[١] / pirk/: ناو. ١. برش؛ کەڕوو؛ کەڕەکیفە ٢. پردۆکە؛ پردەڵە ٣. خلتە؛ تلتە 🇮🇷 ١. کپک ٢. پُل کوچک ٣. دُردی

**پرک**[٢]: ئاوەڵکار. پرتک؛ کەمووکە 🇮🇷 اندک

**پرکاندن** / pirkandin/: چاوگ. ترووکاندن؛ پرووکاندن (چاو) 🇮🇷 بر هم زدن (چشم)

**پرکە** / pirke/: دەنگەناو. پریکە؛ پرمە؛ دەنگی

پێکەنین ☰ صدای خنده

**پرگ** / pirg/: ناو. ١. پرک؛ کەرووو؛ کەرەکیفە؛ برش ٢. بڕکە؛ کەرکەمەڕ ٣. پارچە زەوی ☰ ١. کپک ٢. بخشی از گله ٣. قطعه زمین

▣ **پرگ هەڵێنان:** کەڕوو هەڵێنان؛ برش هێنان ☰ کپک زدن

**پرگە** / pirge/: ناو. گەرا؛ تۆمی مێروو ☰ پوره؛ تخم حشرات

**پرمە** / pirme/: دەنگەناو. ١. دەنگی گریان ٢. پرکە؛ دەنگی پێکەنین ☰ ١. صدای گریه ٢. صدای خنده

**پرمێشک** / pirmêşk/: ناو. پەرمێشک؛ پندریشک؛ پەرەنشک؛ پەزشکە؛ پەزیشکە؛ پەنرێشک؛ پەنەرشکە؛ پەنەڕیشکە؛ پەنێرشک؛ پەنێرشکە؛ پەنرێشە؛ پزیشکە؛ نووسنەک؛ نووسەک؛ نووسەکە؛ دڕکێکی خرتۆکەی دێمەزارە ☰ دوزه

**پرنسیب** / p(i)rinsîb/: ناو. شەنگست؛ دامەزراوی؛ جێکەوتوویی ☰ پرنسیب

**پرنگانەوە** / p(i)ringanewe/: ☜ **پرینگانەوە**

**پروان** / pirwan/: چاوگ. هەڵپروان؛ هەڵپریوان؛ پریوان؛ بە وردی ڕژانە خوار ☰ ریزه ریزه ریختن از بالا

**پرواندن** / pirwandin/: چاوگ. تێپەڕ. //پروانـدت؛ دەپروێنی؛ بپروێنە// پروانن: ١. (بە نینۆک) کڕاندن و لێ کردنەوە ٢. فرکاندن؛ هەڵپرپواندن؛ ساوین و تەکاندن بە نیازی پاکەوە کردن ‹دامێنت قوراوییە، وشکی کەوە و بیپروێنە!› ☰ ١. زدودن با سر انگشت ٢. خاک و گل از لباس زدودن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپرواندن

**پروانن** / pirwanin/: ☜ **پرواندن**

**پروپاتاڵ**[١] / pir û patał/: ناو. ١. وردە و پـردەی ناوماڵ ٢. خرتەوپرتەی بێنرخ ☰ ١. خرت و پرت خانه ٢. اشیاء بی‌ارزش

**پروپاتاڵ**[٢]: ئاوەڵناو. بێکارە؛ بێهونەر ☰ تنبل و بیکاره

**پروسقیان** / p(i)rusq(i)yan/: ☜ **پروسقان**

**پروسنەک** / p(i)rusnek/: ☜ **پەڕەسێلکە**

**پرۆ** / p(i)ro/: ناو. بنتیک؛ پراوە؛ درووومانی کاتی کە جلدوور دەیکا ☰ پرو لباس

**پرۆت** / pirot/: ناو. هەوڕگەر؛ کاسە و کووزەکەر؛ وەستای ئامانان ☰ کوزه‌گر

**پرۆتاکتینیوم** / p(i)rotaktînyum/: ناو. تـوخمی کیمیایی کانزایی ڕادیۆئەکتیڤ بە ڕەنگی سپی زێوین، لە دەستەی ئاکتینیدەکان بە ژمارەی ئەتومی ٩١ و کێشی ئەتومی ٢٣١ ☰ پروتاکتینیم

**پرۆزە** / p(i)roze/: ناو. پەخشان ☰ نثر

**پرۆژە** / proje/: ناو. گەلاڵە؛ پلان؛ کاری بناخە دانان بۆ کارێکی گرینگ و بەبەهرە ☰ پروژه

**پرۆستات** / prostat/: ناو. لـووی ژێـر میزەڵدانی پیاوان ☰ پروستات

**پرۆسک** / p(i)rosk/: ناو. پزیسک؛ پریشکی ئاگر ☰ اخگر

**پرۆگرام** / p(i)rog(i)ram/: ناو. بەرنامە؛ پێـڕەو؛ ڕێنامە؛ ڕێچ ☰ برنامه

**پرۆمیتیوم** / promîtyum/: ناو. توخمی کیمیایی کانزایی لە دەستەی لانتانیدەکان، بە ژمارە ئەتومی ٦١، کە لە شکانی ئورانیۆم بەدی دێ ☰ پرومیتیوم

**پروو** / p(i)rû/: ناو. بژی؛ یاڵ؛ تیسکی سەر مل و سینگی بڕێ گیانەوەر ☰ یال

**پرووسک** / p(i)rûsk/: پێرۆ. ← **ئێسک‌وپرووسک**

**پرووسکە** / p(i)rûske/: ناو. پرێسک ☰ شراره؛ اخگر

**پرووش** / p(i)rûş/: ☜ **پریچ**

**پرووشە** / p(i)rûşe/: ناو. ١. کاری کەم ـکەم خواردن ٢. دەنکە ـ دەنکەی بەفر کە دەبارێ ‹ڕۆڵە خۆ کۆ کەوە پاییزە گژە/ تا پەیا نەبووە پرووشە

و تەومژ «حەقیقی»› ٣. وردە؛ هەندێکی کەم ⊆
١. عمل کم ـ کم خوردن ٢. ریزش پراکندەی
دانەهای برف ٣. خُردە

**پرووشەپرووش** / p(i)rûşep(i)rûş/: ناو. وردە ـ وردە
بارینی بەفر ⊆ ریزش آرام برف

**پرووکان** / p(i)rûkan/: چاوگ. ترووکان (چاو) ⊆
بر هم زدن (چشم)

**پرووکاندن** / p(i)rûkandin/: چاوگ. ترووکاندن
(چاو) ⊆ بر هم زدن (چشم)

**پرووکە** / p(i)rûke/: ناو. دەنکی وردی بەفر ⊆
دانەی ریز برف

**پرووکەپرووک** / p(i)rûkep(i)rûk/: دەنگەناو. ١.
دەنگی نیشتنی دەنکەدەنکەی بەفر ٢.
فینگەفینگ؛ دەنگی گریانی بە سەبر ⊆ ١. صدای
بر هم نشستن دانەهای برف ٢. صدای مویە

**پروونان** / p(i)rûnan/: چاوگ. پرواندن ⊆ زدودن
با سر انگشت

**پروونای** / p(i)rûnay/: چاوگ. پرواندن ⊆ زدودن
با سر انگشت

**پروونەی** / p(i)rûney/: چاوگ. پرواندن ⊆ زدودن
با سر انگشت

**پرەنگاندن** / p(i)rengandin/: چاوگ. ڕاهێنان؛
بارهێنان ⊆ بار آوردن

**پرەنگین** / p(i)rengîn/: چاوگ. ڕاهاتن؛ بارهاتن
⊆ بار آمدن

**پریاسکە** / piryaske/: ناو. پرێسکە؛ پریزە؛
بوخچەی لە دەسرۆکە ⊆ بُقچەی کوچک

**پریچ** / pirîç/: ناوەڵناو. پرووش ‹چاوی پریچ› ⊆
کم‌سو

**پریز** / p(i)rîz/: ناو. ئامرازێک (زیاتر بە دیوارەوە)
بە چەند کونەوە بۆ لێدانی دوو/ سێ شاخەی
کەرستەی کارەبایی ⊆ پریز

**پریزگرد** / p(i)rîzgird/: ☜ پەڕەسێلکە

**پریزە** / p(i)rîze/: ☜ پریاسکە

**پریسک** / p(i)rîsk/: ناو. پلیزک؛ پزیسک؛ پریشکی
وردی ئاگر ⊆ شرارە

**پریسکە** / p(i)rîske/: ناو. بوخچە؛ پریاسکە؛
پارچەیەکی چوارگۆشە بۆ کەلوپەل تێ نان ⊆
بُقچە

**پریسگە** / p(i)rîsge/: ناو. تیشک؛ پرشنگ ⊆ اخگر

**پریشک** / p(i)rîşk/: ناو. بژنگ؛ پژگە؛ پریشکەی ئاو
یان ئاگر ⊆ پَشنگ

**پریشکە** / p(i)rîşke/: ناو. دانوولەی گەنم؛
چێشتی گەنم ⊆ آش گندم جوشیدە

**پریشە** / p(i)rîşe/: ناو. پلاشە؛ تۆلاشەی پەڕاوی
شتی شکاو یان تەقاو ⊆ ترکش

**پریڤ** / p(i)rîv/: ناو. ترووسکە؛ شەوق ⊆
درخشش

**پریق** / p(i)rîq/: دەنگەناو. دەنگی پێکەنین ⊆
صدای خندە

**پریق‌وهۆڕ** / p(i)rîq û hoř/: دەنگەناو. تریق‌وهۆڕ؛
دەنگی پێکەنینی بەرز و حیلکەحیلک ⊆ قاە ـ قاە

**پریکە** / p(i)rîke/: دەنگەناو. تریقە؛ دەنگی بەقەوی
خەنین ‹شەقە و تەقەی گەرم، چەپڵە و چفەی نەرم/
چریکەی وە ناز، پریکەی وە شەرم «مەولەوی»› ⊆
هرهر

**پریمووس** / p(i)rîmûs/: ناو. پەڕامێز؛ ناوی جۆرێک
چرای نەوتی کە ناسووس دەکرا و چێشتیان لە
سەر ساز دەکرد ⊆ پریموس

**پرینتێر** / p(i)rîntêr/: ناو. چاپکەر؛ چاپگەر ⊆
چاپگر

**پرینگان** / p(i)rîngan/: چاوگ. سڵەمان؛ دوور
گرتن؛ خۆ پاراستن ⊆ پرهیز کردن

**پرینگاندنەوە** / p(i)rîngand(i)newe/: چاوگ.
تێپەر. //پرینگاندتەوە؛ دەپرینگێنیەوە؛ بپرینگێنەوە//
سڵەماندنەوە؛ لێ پاراستن ⊆ پرهیز دادن

■ ئاوەڵــناوی بــەرکاری: ـــ/ چــاوگی نــەرێنی: نەپرینگاندنەوە

**پرینگانــەوە** / p(i)rînganewe/: چــاوگ. تێنەپــەڕ. //پرینگایەوە؛ دەپرینگیەوە؛ بپرینگێــوە// پرنگانــەوە: ١. خۆ لێ پاراستن؛ سڵ لێ‌کردن ‹زاتێکم وە بــەر نێ لە هیچ نەپرینگێمەوە «پەشێو»› ٢. سڵەمینەوە؛ سڵ کردن 🇮🇷 ١. پرهیز کردن ٢. رم کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: پرینگاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەپرینگانەوە

**پریوان** / p(i)rîwan/: چاوگ. وەریــن؛ داوەریــن؛ داکەفتن ‹تا گوڵاڵــەی گەشــی بۆنخۆشــی ترۆپکــی کوێستان/ بە گڕی مووشەکی بێگانە بپروێن، دەگــریم «هێمن»› 🇮🇷 ریزش کردن

**پریواندن** / p(i)rîwandin/: چاوگ. بــە شــتێکی وەک نینۆک یان بــە ڕێ خســتن وەرانــدن ‹ئــەو گەنمەشامییە بپریوێنە!؛ جلە قوڕاوییەکەت بپریوێنە!›
🇮🇷 با سرانگشت زدودن

**پرێـزگ** / p(i)rêzg/: نــاو. پرێســـکە؛ پیـــارزگ 🇮🇷 بُقچەی کوچک

**پرێزە** / p(i)rêze/: ناو. سەلیقە 🇮🇷 سلیقە

**- پرێس** / prês-/: پاشگر. ـــ پــەرس؛ - پەرســت ‹خواپرێس› 🇮🇷 - پرست

**پرێســای** / p(i)rêsay/: چـــاوگ. پەرســـــتن 🇮🇷 پرستیدن

**پرێســتەی** / p(i)rêstay/: چــاوگ. پەرســـتن 🇮🇷 پرستیدن

**پرێسک** / p(i)rêsk/: ناو. پرووسکە 🇮🇷 شرارە؛ اخگر

**پرێسکە** / p(i)rêske/: نــاو. پریاســکە؛ پرێــزگ 🇮🇷 بُقچەی کوچک

**پرێسگا** / p(i)rêsga/: ☜ **پەرسگە**

**پڕ**[١] / piř/: نــاو. ١. پڕایی؛ حەشامەت؛ خەڵکی زۆر ٢. چڵەکا؛ چڵەپووش ٣. هەڵمەت 🇮🇷 ١. ازدحام ٢. خَس ٣. خیز

⊡ **پڕ پیا/ پێدا کردن**: ١. لێ نەوین بۆ ڕفانــدن ٢. لــە ناکــاو دە بــاوەش گــرتن 🇮🇷 ١. قاپیــدن ٢. ناگهانی در آغوش کشیدن

**پڕ (پێدا) دان**: پڕ پێدا کــردن؛ گــرتن و ڕفانــدن ‹لاوەکان، دڵپاکەکان، چالاکەکان، پێشــمەرگەکان!/ ئێوە شێری لــێ بســوون و ئێمــە پــڕ دەینــە قەڵــەم «هێمن»› 🇮🇷 قاپیدن

**پڕ**[٢]: ئاوەڵناو. ١. تژە؛ تــژی ‹گیرفانــت پــڕ کــە!› ٢. تایبەتمەندی تەنراوی سفت و تونــد ‹ئــەم بەڕەیــە بــاش چنــراوە، پــڕە› ٣. *[مەجاز]* زۆر زانــا و دانــا ‹مامۆستایەکی پڕە› ٤. تێر؛ مڕ 🇮🇷 ١. پُر؛ انباشتە ٢. سفت و خشن (بافتە) ٣. پُر؛ علّامە ٤. سیر

⊡ **پڕ بە پێست** دەقاودەق 🇮🇷 مُنطبق

⊡ **پڕ بوون**: تژی بوون 🇮🇷 پُر بودن

**پڕ بوونەوە**: ١. دووبــارە تــژی بــوون ٢. *[مەجاز]* هەڵخڕان؛ هەڵخڕیان 🇮🇷 ١. دوبــارە پُــر شــدن ٢. تحریک شدن

**پڕ کردن**: تژە کردنی والا 🇮🇷 پُر کردن

**پڕ کردنەوە**: ١. پڕ کردن ٢. دیسانەوە پڕ کــردن ‹دەبەکە پــڕ کــەوە!› ٣. هەڵــخڕاندن؛ دنــە دان ‹حیسابی پڕیان کردبۆوە!› ٤. تۆمار کردن ‹نــوار پــڕ کردنــەوە› ٥. داپۆشــان و گــرتنی کــون و کــەلێن ‹ددان پــڕ کردنــەوە› ٦. پــڕ کــردنی دەفرێک بە گــاز یــان تراوێــک ‹کەپســوول پڕ کردنەوە› ٧. بەین و شوێنی خاڵــی نەهێشــتن ‹سەف پڕ کردنــەوە› 🇮🇷 ١. پُر کردن ٢. دوبارە پُــر کردن ٣. تحریک کردن ٤ تا ٧. پُر کردن

**پڕ**[٣]: ئاوەڵکار. زۆر؛ زاف؛ گەلــەک ‹پــڕ خوەشــە› 🇮🇷 بس؛ پُر

**پڕ**[٤]: ئامراز. پڕی؛ پڕ بە ‹پڕ گیرفانم نابێ› 🇮🇷 پُر

**پڕ-**[٥]: پێشوشە. ١. زۆرـــ ؛ فــرە ـ ‹تــا شــاد نــەبم بــە مەرحەمەتی کیمیایی تۆ/ بوونی بە زەڕ مەحاڵە مسی قەلبی پڕغەشم «بێخــود»› ٢. لیــپ؛ ســەرڕێژ ‹لــە

سینە جۆششی نالینە، چاوە پڕئەسرین/ ز یُمن جور تو اقلیم درد آباد است! «مەحوی» ▤ ۱و۲. پُر-

پڕئاو پڕئازار پڕگۆشت

پڕبێژ پڕئێش پڕلق‌وپۆ

پڕبەرەکەت پڕکێشە پڕپەرەنگ

پڕپیت پڕدەردیسەر پڕخاڵ

پڕرق پڕزەحمەت پڕبار

پڕخەم پڕئەرک پڕبەر

پڕخۆر پڕچەک پڕتاو

پڕزۆر پڕگرێ

• **پڕ**[6]: پاشەوشە. ۱. ـ پەڕ؛ پەڕان ‹وەرپڕ› ۲. بە دوای ناوەوە دەنووسێ و ئاوەڵناو دروست دەکا، مانای خاوەن شتی زۆر و پێویست یان هەڵمساو دەدا ‹دڵ‌پڕ؛ دەست‌پڕ؛ زگ‌پڕ› ۳. بە دوای پێتەوە، ئاوەڵکار ساز دەکە ‹لەپڕ› ▤ ۱و۲. ـ پُر ۳. قیدساز

**پڕ**[7]: پێزو. ← **کوت‌وپڕ؛ تێروپڕ**

**پڕ**[8]: لێل. ← **پڕوپیرەژن**

**پڕئاو** / p(i)řaw/: ☜ **پاراو**[2]

**پڕان** / p(i)řan/: چاوگ. ۱. دڕان؛ دڕیان ۲. بڕان؛ بڕیان ▤ ۱. بُریده شدن ۲. پاره شدن

**پڕاندن** / p(i)řandin/: چاوگ. ۱. دڕین؛ دڕاندن ۲. بڕین؛ بڕاندن ▤ ۱. بُریدن ۲. پاره کردن

**پڕاوپڕ** / p(i)řawpiř/: ئاوەڵناو. پڕبەپڕ؛ دارماڵ؛ لێواولێو؛ لیپ؛ لیپاولیپ ▤ مالامال

**پڕای** / p(i)řay/: چاوگ. ۱. پەڕین؛ بازدان؛ خۆ هەڵدان ۲. پسان؛ قرتیان ▤ ۱. جهیدن؛ پریدن ۲. گُسستن

**پڕایی** / p(i)řayî/: ناو. ۱. ناوەڕاست ۲. کۆمەڵ و جەماوەر ▤ ۱. جرگه؛ وسط ۲. جمعیت

**پڕبار** / piřbar/: ئاوەڵناو. پڕبەر؛ بەردار؛ بەبەر ▤ پُرثمر

**پڕبایەخ** / piřbayex/: ناو. گرنگ؛ نەخت؛ گرینگ ▤ مُهم؛ باالهمیت

**پڕبەپڕ** / piřbepiř/: ☜ **پڕاوپڕ**

**پڕبەپێست** / piřbepêst/: ئاوەڵناو. تەواو و بێ کەمایەسی ▤ دُرست و حسابی

**پڕبەدڵ** / piřbedił/: ئاوەڵکار. بە ڕاستی؛ لە ناخی دڵەوە ▤ از ته دل

**پڕبەر** / piřber/: ☜ **پڕبار**

**پڕبێژ** / piřbêj/: ئاوەڵناو. [پلار] چەنەباز؛ زۆربڵێ ▤ پُرچانه

**پڕپا** / piřpa/: ناو. پڕپە؛ زیلوو؛ هەزارپێ ▤ هزارپا

**پڕپشت** / piřpişt/: ئاوەڵناو. چڕوپڕ ‹قژی پڕپشت› ▤ پُرپُشت

**پڕپۆڵە** / piřpołe/: ☜ **پڕپۆڵە**

**پڕپووچەڵە** / piřpûçele/: ناو. پەپوولەکلک؛ پەپوولە؛ نەخۆشینی جەرگی ئاژاڵ ▤ کلک

**پڕپە** / piřpe/: ☜ **پڕپا**

**پڕپیت** / piřpît/: ئاوەڵناو. بەرپێژەو؛ بە خێر و بێر ▤ پُربَرکت

**پڕپیش** / piřpîş/: ناو. پڕ و پووش؛ گیای بابردەڵەی وشک ▤ خس و خاشاک

**پڕپێس** / piřpês/: ☜ **پێس**[2]

**پڕتاف** / piřtaf/: ناو. پڕتاو؛ چوارناڵ ▤ پُرتاب؛ چهارنعل

⊡ **بە پڕتاف**: زۆر خێرا؛ تووند و بەلەز ▤ تند و سریع

**پڕتافاندن** / piřtafandin/: ☜ **پڕتافنای**

**پڕتافانن** / piřtafanin/: چاوگ. وە غار خستنی بە چوار ناڵەوە ▤ چهار نعل تاختن

**پڕتافنای** / piřtafnay/: چاوگ. پڕتافاندن ▤ تاختن

**پڕتافیان** / piřtafyan/: ☜ **پڕتافین**

**پڕتافیای** / piřtafyay/: چاوگ. ۱. پەرت بوون ۲. پڕتافانن ▤ ۱. پرت شدن ۲. تاختن

**پڕتافین** / piřtafîn/: چاوگ. پڕتافیان؛ پرتافیان تاختن

**پڕتال** / piřtal/: ناو. ١. کووتاڵ؛ ماڵی گەزی ٢. پەڕتان؛ نوێن؛ پێخەف ١. کالای زرعی ٢. رختخواب

**پڕتان** / piřtan/: ناو. پەڕتال؛ نوێن؛ پێخەف رختخواب

**پڕتاندن** / piřtandin/: چاوگ. ١. پەڕتاندن؛ پەڕتاوتن؛ قرتاندن ٢. دڕاندن؛ دڕین ١. قطع کردن ٢. پاره کردن

**پڕتاو**[1] / piřtaw/: ناو. پڕتاف شتاب

**پڕتاو**[2]: ئاوەڵناو. تاودار؛ بە گوڕوتاو شتابدار

**پڕتیای** / piřt(i)yay/: چاوگ. پچڕان؛ پسان گُسستن

**پڕجوڵە** / piřcûłe/: ئاوەڵناو. بزووک؛ بزۆز پُرجُنبوجوش

**پڕچنای** / piřçnay/: چاوگ. پچڕاندن؛ پساندن پاره کردن

**پڕچەک** / piřçek/: ئاوەڵناو. ساز و تەیار لە باری چەکدارییەوە هەروەها: **پڕچەک بوون؛ پڕچەک کردن** مُسلّح

**پڕچیای** / piřç(i)yay/: چاوگ. پچڕان؛ پسان پاره شدن

**پڕچین** / piřçîn/: ئاوەڵناو. زۆر چیندار؛ ناساف پُرچین و شکن

**پڕحەشامەت** / piřḧeşamet/: ئاوەڵناو. شڵۆق؛ ژاژ شلوغ

**پڕخوێ** / piřx(i)wê/: ئاوەڵناو. تلوخوێ؛ سوێر؛ سوور شور

**پڕخۆر** / piřxor/: ئاوەڵناو. زۆرخۆر؛ فرەخوەر پُرخور

**پڕخۆری** / piřxorî/: ناو. ١. زۆرخۆری؛ فرەخوەری ٢. ئاوردمڵ؛ کولەش؛ زاڵەماسە؛ ئاودوردڵ؛ ماختە؛ نەخۆشینی ئاژەڵ کە زاوریان دەماسێ ١. پُرخوری ٢. بیماری کیسەی صفرای حیوانات

**پڕدان** / piřdan/: ئاوەڵناو. داندار؛ بە دانی زۆرەوە ‹گەنمی ئەمساڵ پڕدانە› پُردانه

**پڕدڕک** / piřdiř(i)k/: ئاوەڵناو. دڕکاوی؛ دڕکدار خاردار

**پڕڕوو** / piřřû/: ئاوەڵناو. ڕوودار پُررو

**پڕڕەنگ** / piřřeng/: ئاوەڵناو. بە ڕەنگی تۆخ ‹چایی پڕڕەنگ ناخۆم› پُررنگ

**پڕز** / piřz/: ناو. ڕیشۆڵەی پارچە پُرز پارچه

**پڕزگ** / piřzig/: ناو. زیپکەی ورد جوش ریز بر پوست

**پڕزۆڵ** / piřzoł/: ☜ **پڕوش**[1]

**پڕزوو** / piřzû/: ئاوەڵناو. ١. بەهێز و تابشت ٢. بەتاقەت؛ پشوودرێژ ١. قدرتمند ٢. شکیبا

**پڕزوولک** / piřzûłik/: ناو. بزگوڕ؛ تیتۆڵ تکه پارچەی کهنه

**پڕزوویی** / piřzûyî/: ناو. پشوودرێژی؛ سەبووری؛ بێنفرەهی شکیبایی

**پڕژ** / piřj/: ئاوەڵناو. بڵاو؛ پەڕژ؛ پەرێشان؛ پرش پراکنده

**پڕژان**[1] / piřjan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //پڕژای؛ دەپڕژێ؛ بپڕژە// ١. بڵاو بوونی شتی ورد ‹مێشکە پڕژاوە لە نێو خۆڵ و خاک/ لەتوپەت بوو لەش و ئەندامی پاک «هێمن»› ٢. بە زەوی وەر بوونی ئاو یان تۆو ١. پراکنده شدن ٢. پاشیده شدن آب یا بذر بر زمین

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: پڕژاو/ چاوگی نەرێنی: نەپڕژان

**پڕژان**[2]: ئاوەڵناو. زۆر بە ئێش و ئازار ‹ژیانی پڕژانی بێدەرمان/ گەییشتیە هەواری هەرمان «هەژار، بۆ کوردستان»› دردناک

**پڕژاندن** / piřjandin/: چاوگ. تێپەڕ. //پڕژاندت؛ دەپڕژێنی؛ بپڕژێنە// پژانن؛ بڵاو کردن افشاندن؛

پاشیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپرژاندن

**پـــرژاو** / pirjaw/: ئاوەڵـــناو. بــــــڵاو؛ پرشـــــاو ‹[ئەستێرەکان] ... هی ئێرە و ئەوێ/ هەمان پەنگر و ژیلەی پرژاوی لە خۆر جێماون/ دەنکی بلاوی هەمان تەسـبیحی هەوداپچـڕاون «پەشـێو»› ☰ پاشـیدە؛ افشانده

**پرژە** / pirje/: نـاو. پرشـکە؛ پریشـکە؛ پـەژک: ١. پریشک؛ پرێشک؛ پرشە ٢. وردەی هەر شت کـە بپرشێ و بلاو ببێتەوە ☰ ١. پشنگ آب ٢. ترکش

• **پرژێن** / pirjên-/: پاشەوشە. ـ پـرژێن؛ ـ پرشـێن؛ بلاوکەرەوە ‹ئاوپرژێن› ☰ ـ پاش؛ ـ افشان

**پرسێلکە** / pirsêlke/: ☜ **پەرەسێلکە**

**پرش** / pirş/: ناو. پرژ ☰ افشان

**پرشان** / pirşan/: چـاوگ. پرژان؛ پژیان ☰ پاشـیدە شدن

**پرشاندن** / pirşandin/: چاوگ. پرژانـدن؛ پژانـدن ☰ پاشیدن

**پرشاو** / pirşaw/: ☜ **پرژاو**

**پرشکە** / p(i)rişke/: ☜ **پرژە**

**پرشکەپیس** / pirşkepîs/: ☜ **پەشکاپیس**

**پرشنگ** / pirşing/: ناو. ١. بژگە؛ پریشکی ئاو و ... ‹نە پرشنگ تاف سەر قەڵوەزان بـۆ/ ئامێتـەی خـاکم وەڵگ خەزان بۆ «بێسـارانی»› ٢. ☜ **پرشـنگ** ☰ ١. پشنگ آب ٢. ☜ **پرشنگ**

**پرشـۆق** / pirşoq/: ئاوەڵـناو. نـووورانی؛ شـۆقدار؛ پرشنگدار ☰ نورانی

• **پرشێن** / pirşên-/: ☜ **ـ پرژێن**

**پرقێنە** / pirqêne/: نـاو. قورقێنە؛ قرپ؛ قولـقێنە. هەروەها: **پرقێنە دان** ☰ آروغ

**پرک** / pirk/: ناو. ١. ژانی منداڵ بوون ٢. بەرووڵـەی نێـوان دەنـدە و دەسـتەندوو ☰ ١. درد زایمـان ٢. ابزاری در خیش

**پرکار** / pirkar/: ئاوەڵناو. کارزۆر؛ کارکۆ ☰ پُرکار

**پرکێش** / pirkêş/: ئاوەڵناو. ١. چاوچنۆک؛ بەتەماح ٢. گرانجان؛ گرانفرۆش ☰ ١. آزمند ٢. گرانفروش

**پرکێشی** / pirkêşî/: ناو. ١. کـاری سـوور بـوون و پـێداگـرتن لـە سـەر مەبەسـت ٢. گوسـاخی؛ ڕووداری ٣. تـەلاس؛ زێـدەڕۆیی ☰ ١. اصـرار؛ لجاجت ٢. گستاخی ٣. زیادەروی

⊡ **پرکێشی نـەکردن**: ١. لـــە ڕوو هەڵـــنەهاتن ‹پرکێشی ناکەم دەربڕم ڕازم/ چون گوێ ناگری تۆ لە ئاوازم «فولکلۆر»› ٢. زێدەڕۆیی نەکردن ☰ ١. گُستاخی نکردن ٢. زیادەروی نکردن

**پرگۆشت** / pirgoşt/: ئاوەڵـناو. گۆشـتن؛ قەڵـەو ☰ گوشتالو

**پرمان** / pirman/: ☜ **پرمین**

**پرمانـدن** / pirmandin/: چاوگ. تێپەڕ. //پرماندت؛ دەپرمێنی؛ بپرمێنە// پرمانن؛ پرمە کردن ☰ صدا از بینی درآوردن (ویژەی اسب)

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپرماندن

**پرمانن** / pirmanin/: ☜ **پرماندن**

**پرمو** / pirmû/: ئاوەڵناو. گونگولی؛ پرپشت (پـرچ) ☰ پُرپُشت (موی سر)

**پرمە** / pirme/: دەنگەناو. فرمە: ١. دەنگی گریانی لە ناکاو ٢. دەنگـی لـووتی یەکسـم ‹... پرمـەی محەندکان، لووزەوی کورە بەبان، شریخەی دەمانچان، مامز گران بوو، ڕێی نەبوو هەڵێ ... «فولکلۆر، پایزە»› ☰ ١. صدای گریە ٢. صدای بینی اسب

**پرمەترسی** / pirmetirsî/: ئاوەڵـناو. بـێئامـان؛ زاڵەتەقێن ☰ خطرناک

**پرمین** / pirmîn/: چـاوگ. پرمان؛ پرماندن ☰ صدا از بینی درآوردن (اسب)

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپرمین

**پرنا**[1] / pirna/: ناو. قاش؛ قاژە؛ خاش ☰ قاچ

**پرنا**[2]: ئاوەڵناو. بە قاش بڕاو؛ قاش کراو ☰ قاچ شده

**پرناپوچ** / piřnapûç/: ☜ **پروپوچ**

**پرنای** / piřnay/: چاوگ. پەڕاندن ☰ قطع کردن

**پرنۆ** / piřno/: ناو. دەلیل؛ بەلگە ☰ دلیل؛ بُرهان

**پرنۆڵ** / piřnoł/: ناو. بزگوڕ ☰ تکه پارچەی کهنه

**پروپا** / piř û pa/: ناو. پـروپێ؛ لاق و لەتـەر؛ دا و دەلینگ ☰ ساق و دامن بالای ساق

**پروپاتاڵ** / piř û patał/: ☜ **ماڵات**

**پروپاگەنـدە** / piřupagende/: نـاو. پرۆپاگەنـدە؛ بانگەشە؛ ڕاگەیێنی؛ کاری ڕاگەهاندن ☰ تبلیغات

**پروپاگەندەچی** / p(i)řupagendeçî/: نـاو. باسـرێژ؛ بالگاشەچی ☰ تبلیغاتچی

**پروپرتـۆخ**[1] / piř û piřtox/: ئاوەڵناو. پروپەرداخت؛ تێروتەسەل ‹کاری پروپرتۆخم لەگەڵیدا کردووە› ☰ بی‌کم‌وکاست

**پروپرتۆخ**[2]: ئاوەڵکار. پروپـەرداخت؛ تێروتەسـەل؛ تـەواو و بـێ‌کـەم‌وکـووڕی ‹تـەواوی ڕووداوەکـەم پروپرتۆخ بۆ گێڕایەوە› ☰ بی‌کم‌وکاست

**پروپنجل** / piř û pincil/: ئاوەڵناو. پیس و چەپەڵ و نارێک ☰ کثیف و نامرتب

**پروپۆشته** / piř û poşte/: ئاوەڵناو. *[کنایە]* کـۆک؛ خۆش‌بژیو؛ ساز و تەیار ☰ مُرفه

**پروپـوچ**[1] / piř û pûç/: نـاو. ۱. قسـە و باسـی بێ‌مانا و بێ‌کاکڵ و ناڕاست ‹خۆزگـەم بـە کەسـێ نیشان و ناوێکی نەبوو/ لـە شـوێن پـروپووچ خەیاڵـی خاوێکی نەبوو «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ۲. پڕ یا پووچ؛ پرناپووچ ☰ ۱. یاوه؛ خرافات ۲. پُر یا پوچ

**پروپوچ**[2]: ئاوەڵناو. بێ‌نرخ؛ هیچ و پووچ ‹ڕا مەکە لە دوای کـاری پــروپووچ/ هەڵئەخلیسـکێی لەپــڕ لنگەوقووچ «پیرەمێرد»› ☰ بیهوده

**پروپـوش** / piř û pûş/: ناو. پڵ‌وپـووش؛ پـووش و پـەلاش ‹لافـاوی مێـژوو بـەگوڕە و تـاوە/ پیسـی و پروپووش ئەخاتـە لاوە «هـەژار، *بـۆ کوردستان*»› ☰ ساقەی خشکیده و باریک درخت و گیاه

**پروپەرداخت** / piř û perdaxt/: ☜ **پروپرتۆخ**

**پروپەشێو** / piř û peşêw/: ئاوەڵناو. بـێ‌سـەروبەر؛ حاڵ‌پەرێشان ☰ پریشان‌حال

**پروپیت** / piř û pît/: نـاو. وردە حاجـەتی مـاڵ ☰ خُرده اسباب خانه

**پروپیتـاڵ** / piř û pîtał/: نـاو. خرتەوپرتـە؛ شت‌ومەکی ژنان ☰ خرت‌وپرت زنانه

**پروپیرەژن** / piř û pîrejin/: ناو. *[پلار]* ژنانی پیری بێکاری فرەبێژ ☰ پیرزنان یاوەگو

**پروپێ** / piř û pê/: ☜ **پروپا**

**پروسـقان** / p(i)řusqan/: چـاوگ. تێپـەڕ. //پروسـقای؛ دەپروسـقێی؛ بپروسـقێ// پروسـقیان؛ پرووسقان: ۱. برووسـقیان؛ بزرکـان؛ پروسـقیان؛ هەڵگەڕانی هەندێک تەوش وەک شیر ۲. ڕەنـگ پەڕین لە ترسان ☰ ۱. بُریدن (شیر) ۲. رنگ باختن از ترس

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: پروسـقاو/ چاوگی نـەرێنی: نەپروسقان

**پروسـقاندن** / p(i)řusqandin/: چـاوگ. تێـپەڕ. //پروسـقاندت؛ دەپروسـقێنی؛ بپروسـقێنە// پرووسـقاندن؛ پرووسـقانن: ۱. برووسـقاندن؛ بزرکاندن؛ تێکدانی باری ئاسایی هەندێک تـەوش وەک شیر ۲. ڕەنـگ پەڕانـدن لـە ترسـان ☰ ۱. بُریدن (شیر) ۲. رنگ به رو نگذاشتن (از ترساندن)

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: ـــ/ چـاوگی نـەرێنی: نەپروسقاندن

**پروسقیان** / p(i)řusq(i)yan/: ☜ **پروسقان**

**پرۆپاگەندە** / p(i)řopagende/: ☜ **پروپاگەندە**

**پرۆژە** / p(i)řoje/: ناو. گەلاڵە؛ گلاڵە؛ گولالە؛ پلان ☰ طرح؛ پروژه

**پرۆژەیاسـا** / p(i)řojeyasa/: نـاو. لایەحـە؛ نووسراوەیێ بۆ پێشکەش کـردن بـە لێژنەیـەکی بڕیاردەر ☰ لایحه

**پرۆسە** / přose/: ناو. ڕەوت؛ ڕەوتانە ☰ فرایند؛ فراگرد

**پرۆفسۆر** / p(i)řofisor/: ناو. پسپۆڕ؛ پستۆڕ: ١. مامۆستای زانکۆ ٢. بلیمەت؛ زانا؛ لێزان ☰ ١و٢. پرفسور

**پرۆڤە** / p(i)řove/: ناو. ڕەوتی ڕاهێنان ☰ تمرین

**پرۆگرام** / p(i)řogram/: ناو. بەرنامە؛ ڕێنامە ☰ برنامه

**پرۆم** / p(i)řom/: ناو. لووتکەی کێو؛ ترۆپکی چیا ☰ قُله

**پرۆناڤ** / p(i)řonav/: ناو. *[ڕێزمان]* پرۆنێو؛ جێناو ☰ ضمیر

**پرۆنێو** / p(i)řonêw/: ☜ **پرۆناڤ**

**پرووچکان** / p(i)řûçkan/: ☜ **پچەڕان**

**پرووچکاندن** / p(i)řûçkandin/: ☜ **پچەڕاندن**

**پرووچکین** / p(i)řûçkîn/: ☜ **پچەڕان**

**پرووز** / p(i)řûz/: ناو. بۆپرووز؛ پەردووخ؛ بۆنی خوری یان مووی سووتاو ☰ بوی پشم یا موی سوخته

**پرووزان** / p(i)řûzan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //پرووزای؛ دەپرووزی؛ بپرووزە// پرووزیان: ١. سووتانی کولکە خوری و موو ٢. کزیان؛ خیچان لە کایەدا، بەتایبەت لە کایەی بازەڵێن و زاپێندا ☰ ١. سوختن پشم و مو ٢. سوختن در بازی

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: پرووزاو/ چاوگی نەرێنی: نەپرووزان

**پرووزاندن** / p(i)řûzandin/: ☜ **پرووزانن**

**پرووزانن** / p(i)řûzanin/: چاوگ. تێپەڕ. //پرووزانت؛ دەپرووزێنی؛ بپرووزێنە// پرووزانـدن؛ سووتاندنی خوری و موو ☰ سوزاندن پشم و مو

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپرووزانن

**پرووزاو** / p(i)řûzaw/: ئاوەڵناو. پرووزیاگ؛ پرووزیاو؛ سووتاو (کولکە) ☰ سوخته (پشم و مو)

**پرووزکان** / p(i)řûzkan/: چاوگ. پچڕان؛ بڕیان ☰ قطع شدن

**پرووزکاندن** / p(i)řûzkandin/: چاوگ. پچڕانـدن؛ بڕین ☰ قطع کردن

**پرووزە** / p(i)řûze/: ناو. سووتاوە (خوری) ☰ سوخته (پشم)

**پرووزیاگ** / p(i)řûzyag/: ☜ **پرووزاو**

**پرووزیان** / p(i)řûzyan/: ☜ **پرووزان**

**پرووزیاو** / p(i)řûzyaw/: ☜ **پرووزاو**

**پرووزیەی** / p(i)řûzyey/: چاوگ. پرووزان؛ هەڵپرووزان ‹بوو پەپوولە، پرووزیەوەنە/ نەیاوۆ سوودێ و چی ڕۆشنایی «سەیدی»› ☰ سوختن و خاکستر شدن

**پرووسقان** / p(i)řûsqan/: ☜ **پرووسقان**

**پرووسقاندن** / p(i)řûsqandin/: ☜ **پرووسقاندن**

**پرووسقانن** / p(i)řûsqanin/: ☜ **پرووسقاندن**

**پرووسقیان** / p(i)řûsq(i)yan/: ☜ **پرووسقان**

**پرووسک** / p(i)řûsk/: ☜ **پرووسکە**

**پرووسکان** / p(i)řûskan/: چاوگ. لە بەر یەک هەڵوەشان ☰ از هم گُسستن

**پرووسکاندن** / p(i)řûskandin/: چاوگ. لە بەر یەک هەڵوەشاندن ☰ از هم گسیختن

**پرووسکە** / p(i)řûske/: ناو. ئاورینگ؛ پریشکی ئاگر؛ پرووسک ☰ اخگر؛ شراره

**پرووش**[1] / p(i)řûş/: ناو. پرز؛ تووک؛ کولکە ‹کەواکەم پرووشی هەڵداوە› ☰ پُرز

**پرووش**[2]: ئاوەڵناو. کەمحوکم ‹سەرە، لەرزۆک و قول و چۆکە، شل و زگ، پەنەماو/ لاملم خوارە، پشووم سوارە، پرووش و کزە چاو «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ کم‌سو

**پرووشە** / p(i)řûşe/: ئاوەڵکار. ١. کاری کەم ـ کەم خواردن ٢. بارینی دەنکە ـ دەنکەی بەفر ☰ ١. عمل کم ـ کم خوردن ٢. ریزش دانه‌های برف

**پڕووشەچاو** / p(i)řûşeçaw/: ناوەڵناو. مژمۆر؛ خووتەکە؛ چاوچکۆلە ⊑ چشم‌کوچک

**پڕووکان** / p(i)řûkan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //پڕووکای؛ دەپڕووکێی؛ بپڕووکێ// پڕووکیان؛ بزڕکان ⊑ پژمرده شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: پڕووکاو/ چاوگی نەرێنی: نەپڕووکان

**پڕووکاندن** / p(i)řûkandin/: چاوگ. تێپەڕ. //پڕووکاندت؛ دەپڕووکێنی؛ بپڕووکێنە// بزڕکاندن ‹هەرچەن یاری نەبینێ/ وەختە خۆی بپڕووکێنێ «قانع»› ⊑ پژمُرده کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپڕووکاندن

**پڕووکنای** / p(i)řûknay/: چاوگ. پڕووکاندن ⊑ پژمرده کردن

**پڕووکیان** / p(i)řûkyan/: ☜ **پڕووکان**

**پڕووکیای** / p(i)řûkyay/: چاوگ. پڕووکان ⊑ پژمرده شدن

**پڕەسێلکە** / p(i)řesêlke/: ☜ **پەڕەسێلکە**

**پڕهەست** / piřhest/: ئاوەڵناو. گەرموگوڕ؛ هەستۆک؛ تیژهەست؛ خوێنگەرم ⊑ خونگرم

**پڕهەنگ** / piřheng/: ناو. پەڕهەنگ؛ فەرهەنگ ⊑ فرهنگ

**پڕی** / p(i)řî/: ناو. تۆکمەیی؛ چڕی؛ دۆخی پڕ بوونی دەفر یان هەر تەنێکی ناو هەڵۆڵ ⊑ پُری

**پڕیچک** / p(i)řîçk/: ناو. پڕژە؛ پرشە ⊑ پشنگ آب

**پڕیش** / p(i)řîş/: ناو. بزگوڕ؛ ڕیزاڵ؛ ڕیشاڵ ⊑ پارچه کُهنەی پوسیده

**پڕیش ـ پڕیش** / p(i)řîş p(i)řîş/: ئاوەڵناو. ڕیشاڵ ـ ڕیشاڵ؛ ڕیزاڵ ـ ڕیزاڵ ⊑ تکه ـ تکه

**پڕیشک** / p(i)řîşk/: ناو. پرشە/ پشکی ئاو ⊑ پشنگ آب

**پڕیشکە** / p(i)řîşke/: ☜ **پڕژە**

**پڕیشە** / p(i)řîşe/: ناو. پلاشە ⊑ تَرکش

**پڕێ** / p(i)řê/: ناو. ترس ⊑ ترس

**پڕێشک** / p(i)řêşk/: ☜ **پڕژە**

**پ.ز.** / pi.zi./: ناو. کورتەی پێش زایین ⊑ ق.م. (قبل از میلاد)

**پز**[1] / piz/: ناو. ۱. پیزە؛ تۆل؛ بێچوو لە ناو زگدا ۲. زێ؛ شەرمی مێینە ۳. کوان؛ دمەڵ ٤. پس؛ کوڕ ‹پزمام› ⊑ ۱. جنین ۲. آلت تناسلی ماده ۳. دُمل ۴. پسر

**پز**[2]: ئاوەڵناو. تفت؛ چێژەی زوانگیر ⊑ گس مزه

**پزان** / p(i)zan/: ☜ **پزدان**

**پزپزۆک** / pizp(i)zok/: ناو. جگەرە؛ سگار ⊑ سیگار

**پزدار** / pizdar/: ئاوەڵناو. پسدار؛ ئاوس ⊑ آبستن؛ باردار

**پزدان** / pizdan/: ناو. پزان؛ پسدان: ۱. بێچووودان؛ منداڵدان ۲. تیزانگ؛ ئەوەی بۆ گاڵتەی منداڵ فووی تێ دەکەن ⊑ ۱. زهدان ۲. بادکنک

**پزدۆک** / pizdok/: ناو. لک؛ لکە؛ گرۆڤەر یا گۆشتی زیادی یا زیپکەی گەورە بە سەر پێستی لەشەوە ⊑ غُدەی گوشتی روی پوست

**پزڕووک** / pizrûk/: ناو. دڵۆپەی بارانی هوور ⊑ قطرات ریز باران

**پززە** / pizze/: ناو. پزوو؛ نەخۆشییەکی پەزە ⊑ نوعی بیماری گوسفند

**پزگ** / pizig/: ناو. پزوو؛ پزی؛ پزگە: ۱. جێگەی دۆخین لە دەرپێ ۲. هەرچی لێوی هەڵدووراب‌ێ و بەنی تێدا بێ، وەک زارکی کیسە و توورەکە ۳. نەخۆشییەکی مەڕ ⊑ ۱. نیفەی شلوار ۲. نیفە ۳. نوعی بیماری گوسفند

**پزگە** / pizge/: ☜ **پزگ**

**پزلگرد** / pizilgird/: ☜ **پەڕەسێلکە**

**پزلوخ** / pizlûx/: ☜ **پووزەوانە ـ۱**

**پزلی** / pizlî/: ناو. پزدان؛ جێگەی بێچوو لە زگدا

🇮🇷 زهدان؛ رَحِم

**پزمام** / pizmam/: ☜ **پسمام**

**پزۆر** / pizor/: ناو. هەناو؛ ورگ و ناو؛ ناو زگی حەیوان 🇮🇷 احشاء

**پزو** / p(i)zû/: ناو. ١. پزگ؛ نافەک؛ شوێنی تێهەڵکێشانی بەن و دۆخین لە دەرپێ و توورەکە و شتی وادا ‹تەڕی تێ‌ناگەی چاتر ترساوە/ دەسنوێژ ڕاناگرێ پزووی پساوە «هەژار، بۆکوردستان»› ٢. منالدان؛ پزدان ٣. ☜ **پزە** ٤. گیایەکە لاسکی بڕگەبڕگەیە و بۆ نەخۆشی پزگ لە ملی مەڕی دەکەن، گوایە چاکی دەکاتەوە ٥. بەفری کەڵەکە بەستووی بەر دەرک و دیواران ‹تەلان، گەوە، بانوو، بستوو/ کانی، زنە، ڕنوو، پزوو «هێمن»› 🇮🇷 ١. نیفه ٢. زهدان ٣. ☜ **پزە** ٤. گیاهی است ٥. برف انباشتەی پشت در

**پزووژن** / p(i)zûjin/: ناو. دەرزی لە تەبەنە درێژتر و لە سووژن پچووکتر 🇮🇷 سوزن کوچکتر از جوالدوز و بزرگتر از لحافدوز

**پزووسک** / p(i)zûsk/: ناو. ئاورینگ؛ پرووسک؛ پزووسکە؛ پریشکی ئاگر 🇮🇷 شراره؛ اخگر

**پزووسکە** / p(i)zûske/: ☜ **پزووسك**

**پزە** / p(i)ze/: ناو. فزە؛ نەخۆشی مەڕ 🇮🇷 از بیماری‌های گوسفند

**پزی** / pizî/: ناو. ١. تفتی؛ گەسی ٢. ☜ **پزگ** 🇮🇷 ١. مزەی گس ٢. ☜ **پزگ**

**پزیزوون** / p(i)zîzûn/: ناو. خێرۆک؛ گوڵەدەغلی ڕژاوی پاش درەو 🇮🇷 خوشەهای افتادە پس از درو

**پزیسک** / p(i)zîsk/: ناو. ئاورینگ؛ پزیسکە؛ پسیزک؛ پریشکەی ئاگر؛ نەختووکە ئاگرێک ‹پزیسکێ، گوندێ ئەسووتێنێ «مەسەل»› 🇮🇷 اخگر؛ شرارە

**پزیسکە** / p(i)zîske/: ☜ **پزیسك**

**پزیشک** / p(i)zîşk/: ☜ **بژیشك**

◻ **پزیشکی داد**: ☜ **پزیشکی یاسایی**

**پزیشکی یاسایی**: پزیشکی داد؛ بژیشکی قانوونی؛ لقێ لە زانست و شێوازی بژیشکی کە سەر دەرکردن لە چۆنیەتی زامدار بوون یان کوژرانی مرۆی لە ئەستۆیە 🇮🇷 پزشکی قانونی

**پزیشکە** / p(i)zîşke/: ☜ **پرمێشك**

**پزیشکی** / p(i)zîşkî/: ناو. بژیشکی: ١. زانستێ کە دەپەرژێتە سەر ناسین و دەرمان کردنی نەخۆشی مرۆ ٢. لقێک لە فێرکاری زانستگا لە بواری ناسین و دەرمان کردنی نەخۆشییەکان 🇮🇷 ١. علم پزشکی ٢. رشتەی پزشکی

**پزیشکیار** / p(i)zîşkyar/: ناو. بژیشکیار؛ بژشکیار؛ هاریکاری پزیشک؛ تیمارکەر؛ برینپێچ 🇮🇷 پزشکیار

**پزیم** / p(i)zîm/: ناو. ئاغزوونە؛ ئاڵقەی داخستنی قایشی ناوقەد و کەوش 🇮🇷 سگک

**پزینک** / p(i)zînik/: ناو. بلامک؛ بزمک؛ دەمبێنی بێچووی ئاژاڵ 🇮🇷 دهانبند حیوان شیرخوار

**پژ** / pij/: ناو. ١. داسووکەی دەخڵ ٢. یالی وڵاخ ٣. پژاڵ؛ چرۆی باریکی دار 🇮🇷 ١. پُرز غلّه ٢. یال ٣. جوانەی نازک درخت

**پژاڵ** / p(i)jał/: ناو. ١. پژ؛ چرۆی هەرە باریکی دار ٢. پر و پووش 🇮🇷 ١. جوانەی تازە زدەی درخت ٢. خس و خاشاک

**پژان** / p(i)jan/: چاوگ. تینەپەر. //پژای؛ دەپژێی؛ بپژێ// پژیان: ١. پرژان ‹دڵۆپی سارد و فێنک با لە سەر دار و دەوەن برژێ/ پەپوولەی زەردی ئاڵتوونی لە سەر لق هەڵوەرێ بپژێ «گۆران»› ٢. *[مەجاز]* زۆرەوانی کردن؛ ملانێ گرتن 🇮🇷 ١. پاشیدن ٢. کُشتی گرفتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: پژاو/ چاوگی نەرێنی: نەپژان

**پژاندن** / p(i)jandin/: چاوگ. تێپەر. //پژاندت؛ دەپژێنی؛ بپژێنە// ١. بلاو کردنی ورد ٢. وەشاندن

‹هەور مرواری ئـەپژێنێ/ شـەماڵ زینـدەگانی دێنـێ «پیرەمێرد»› ☰ ۱. پخش و پَلا کردن ۲. افشاندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپژاندن

**پژانن / p(i)janin/**: ☜ **پرژاندن**

**پژانە / p(i)jane/**: ناو. پژێنە؛ پژینەک ☰ اسپری

**پژاو / p(i)jaw/**: ئاوەڵناو. ۱. پژیاگ ۲. وەشـاو ☰ ۱. پاشیده ۲. افشانده

**پژبێن / pijbên/**: ناو. ۱. پشتێن؛ پشتان؛ پشتوێن؛ پشـتێند؛ پـژتێن؛ پـژوێن؛ پژوێنـە؛ پشـپێنت؛ پشتبێن ۲. کەمبەرە؛ کەمەربەند ☰ ۱. شال کمر ۲. کمربند

**پژتێن / pijtên/**: ☜ **پژبێن ـ۱**

**پژقاندن / pijqandin/**: چاوگ. پژاندن؛ پرشـاندن ☰ پاشیدن

**پژک / pijik/**: ناو. ۱. خونچە؛ پشـکوژ ۲. پشـک؛ داروو‌کەیەک بۆ پینـە دە مەشـکەی کـون بـووی ڕادەکەن ☰ ۱. غُنچە ۲. پینەی چوبی سوراخ مشک

**پژکوژ / pijkûj/**: ناو. پشکوژ؛ خونچە ☰ غُنچە

**پژگاڵ / pijgał/**: ناو. ۱. مژۆڵـی؛ سـەرگەرمی ۲. سەرقاڵی؛ کاروبار ☰ ۱. سرگرمی ۲. مشغله

**پژگنای / pijgnay/**: چاوگ. پژاندن ☰ پاشیدن

**پژگوبڵاو / pijg û b(i)ław/**: ئاوەڵناو. پرژ و بڵاو ☰ پراکنده و بەهم‌ریخته

**پژگە / pijge/**: ناو. پریشک؛ پشکی ئاو ☰ قطـرات پخش‌شدەی آب

**پژگیای / pijgyay/**: چاوگ. پژان ☰ پاشیده شدن

**پژگیر / pijgîr/**: ناو. خاولی؛ مەرحەمە ☰ حوله

**پژل / pijil/**: ناو. پێ داگری ☰ پافشاری

**پژلاندن / pijlandin/**: چـاوگ. ۱. سوور بوون و پا داگرتن لە سەر شـتێ ۲. لـەت‌وکـوت کـردن ۳. هەڵتۆقین؛ ماسین ☰ ۱. پافشاری کـردن ۲. لـت و پار کردن ۳. آماسیدن

**پژلمە / pijilme/**: ئاوەڵناو. سیس؛ ژاکاو ☰ پژمُرده

**پژلمیان / pijilm(i)yan/**: چاوگ. ژاکان؛ سیسـان ☰ پژمُردن

**پژڵ / pijił/**: نـاو. ۱. هـەژگ؛ گـژ و گیـا ۲. لقـی بـاریکی سـەرەوەی دار ☰ ۱. خـس و خاشـاک ۲. شاخەی نازک انتهایی درخت

**پژمان[۱] / pijman/**: ☜ **پژمین**

**پژمان[۲]**: ئاوەڵناو. پەشیمان ☰ پشیمان

**پژماندن / pijmandin/**: چاوگ. وە پژمـە خسـتن ☰ به عطسه انداختن

**پژمای / pijmay/**: چاوگ. پژمین ☰ عطسه کردن

**پژمنای / pijm(i)nay/**: چـاوگ. پژمانـدن ☰ بـە عطسه انداختن

**پژم و هۆڕ / pijm û hoř/**: ناو. پژمـەی لـە سـەر یەک و بەقەو ☰ عطسەی پیاپی و شدید

**پژمە / pijme/**: نـاو. پشمە؛ پنژە؛ پێنژ؛ پێنیژ؛ پنژ؛ ئارۆشـک؛ بێنشـک؛ بێنـژک؛ بینشـت؛ هـەپش؛ فشک؛ کژ؛ دۆخی لە ناکاو و بە تێکڕا دەرپـەڕینی هەوای نێو سی لە دەم و لووتەوە. هەروەها: **پژمە کردن** ☰ عطسه

**پژمەپژم / pijmepijm/**: نـاو. پشـمەی لـە سـەر یەک ☰ عطسەی پیاپی

**پژمین / pijmîn/**: چاوگ. تێنەپەر. //پژمیت؛ دەپژمی؛ بپژمە// پژمان؛ پشمین؛ پنژین؛ پێکژین ☰ عطسه کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپژمین

**پژن / pijin/**: ئاوەڵناو. ۱. بە لک‌وپۆپ ۲. پـرچن و موو تێکەڵاو ☰ ۱. پرشاخ و برگ ۲. ژولیده‌مو

**پژنچە / pijinçe/**: نـاو. ۱. قاشاق؛ ڕنەکی یەکسـم مالین ۲. کەڵکیت؛ دەفە؛ شانەی جـۆلایی ☰ ۱. قشو؛ بُرس ستور ۲. دفته

**پژوارە / pijware/**: ناو. پرسیار ☰ سؤال

**پژوپۆ / pij û po/**: نـاو. لـق‌وپـۆپ؛ ئـەو لکانـەی هەڵدەپرتێودرێن ☰ شاخه و برگ قابل هرس

**پژوێن / pijwên/:** ☜ **پژبێن ـ١**

**پژوێنە / pijwêne/:** ☜ **پژبێن ـ١**

**پژۆنی / p(i)jonî/:** ئاوەڵناو. واتایی؛ مەعنەوی؛ پێوەندیدار بە بیر و هەستەوە ☰ معنوی

**پژو / p(i)jû/:** ناو. بژ؛ یاڵ؛ مووی ملی یەکسم و شێر ☰ یال

**پژوون / p(i)jûn/:** ناو. گزرە ☰ علف پرس شدە

**پژە / p(i)je/:** ناو. پریشکی تراو ☰ پشنگ

**پژیاگ / pijyag/:** ☜ **پژاو**

**پژیاگی / pijyagî/:** ناو. بڵاوی؛ وڵاوی ☰ پراکندگی

**پژیان / pijyan/:** ☜ **پژان**

**پژین / p(i)jîn/:** چاوگ. ١. کوڵان؛ کوڵیان ٢. پژان؛ پژیان ٣. دارسان؛ ڕژانەدەر (وەک خوێنی لووت) ☰ ١. پُختن ٢. پاشیدن ٣. بیرون زدن

**پژینەک / p(i)jînek/:** ☜ **پژانە**

• **پژێن / p(i)jên-/:** پاشەوشە. بپژێن: ١. ـ پاشێن ‹ئاوپژێن› ٢. ـ وەشێن ‹تۆپژێن› ☰ ١. ـ پاش ٢. ـ افشان

**پژێنە / p(i)jêne/:** ☜ **پژانە**

**پس[١] / pis/:** ناو. ١. بار؛ پز ٢. کوڕ؛ فرزەندی نێر ‹پسمام› ☰ ١. جنین ٢. پسر

**پس[٢]:** ☜ **پسك**

• **پس[٣]:** پاشەوشە. پساو؛ لەبەریەکچوو ‹نەپس› ☰ ـ گُسل

**پس[٤]:** دەنگ. ١. فس؛ دەنگی دەرچوونی بای شتێ ٢. دەنگی دەنگ دان و دەرکردنی پشیلە ☰ ١. فِس؛ صدای خارج شدن بادِ چیزی ٢. پیشتە؛ صدای راندن گربە

**پسات / p(i)sat/:** ناو. ١. جووات؛ ناوکۆمەڵ؛ جەرگەی حەشامات ‹بۆتە پەندی پساتێ› ٢. بسات؛ کەلوپەل ‹چ پساتێکی چنیوە؟!› ☰ ١. اجتماع ٢. بساط

**پسان / p(i)san/:** چاوگ. تێنەپەڕ. //پسای؛ دەپسێ؛ بپسە// پسیان: ١. قەتیان؛ لە بەر یەکچوونی بەن و داو ‹چاوێکی خشاندبا بە مندا/ دەپسا ڕەگی بێ‌کەسیم لە بندا «هەژار، مەم و زین»› ٢. *[مەجاز]* مردن لە بەر ماندوویی ☰ ١. گُسستن ٢. از خستگی مردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: پساو/ چاوگی نەرێنی: نەپسان

**پساندن / p(i)sandin/:** چاوگ. تێپەڕ. //پساندت؛ دەپسێنی؛ بپسێنە// پسانن: ١. لە بەر یەک بردن ‹بپسێنە لە پێ تۆ زنجیر و کۆت/ دێدە گیان بدە یاری برای خۆت «هێمن»› ٢. *[مەجاز]* کوشتن ☰ ١. گسلانیدن ٢. کُشتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپساندن

**پساندنەوە / p(i)sand(i)newe/:** چاوگ. قەبزداندن؛ دیسانەوە لێک بەردان ☰ واگُسستن

**پسانک / p(i)sanik/:** ناو. بێچوو ☰ بچە

**پسانن / p(i)sanin/:** ☜ **پساندن**

**پسانەوە / p(i)sanewe/:** چاوگ. تێنەپەڕ. //پسایەوە؛ دەپسێیەوە؛ بپسێوە// ١. دووبارە لە بەر یەک چوون ٢. دوایی هاتن ‹ئەوە چ بوو؟ هەر نەپسایەوە؟› ☰ ١. دوبارە گُسستن ٢. بە پایان رسیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: پساوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەپسانەوە

**پساو / p(i)saw/:** ئاوەڵناو. ١. قرتاو؛ پچڕاو ‹تەزبێحی پساو› ٢. لەبەریەکچوو ☰ ١. گسستە ٢. وارفتە

**پسپان / pispan/:** ناو. ١. پینەی پەڕۆ ٢. سرتە؛ سرکە؛ قسەی بە ئەسپایی ☰ ١. پینەی پارچە ٢. نجوا

**پسپاندن / pispandin/:** چاوگ. سرتە کردن؛ سرکاندن ☰ نجوا کردن

**پس ـ پس[١] / pis pis/:** ئاوەڵناو. پچڕـ پچڕ؛ بڕگە ـ بڕگە ☰ مُنقطع

**پس ـ پس[٢]:** ئاوەڵکار. زۆرپچڕاو؛ بە چەند جێ لەت

🇮🇷 پاره ـ پاره

**پسپس**[۲]: دەنگ. پشـپش؛ وشـەی بانـگ کـردنی پشیلە 🇮🇷 کلمەی صدا زدن گربه

**پسپساندن** / pisp(i)sandin/: چاوگ. سرتەسـرت کردن 🇮🇷 نجوا کردن

**پسپستلێ** / pispist(i)łê/: نـاو. جۆلاتەنـەـە؛ جاڵجاڵووکە 🇮🇷 عنکبوت

**پسپسەکۆڵە** / pisp(i)sekołe/: ☜ **پەسپەسەکۆڵە**

**پسپسەکەڵە** / pisp(i)sekełe/: ناو. ۱. جۆلاتەنـە؛ جاڵجاڵووکە ۲. ☜ **پەسپەسەکۆڵە** 🇮🇷 ۱. عنکبوت ۲. ☜ **پەسپەسەکۆڵە**

**پسپیک** / pisp(i)sîk/: ☜ **پشیلە**

**پسپۆڕ** / pispoř/: ناوەڵناو. پسـپۆز: ۱. چـازان و لێزانی کار ‹کوتی قـالاوەڕەشـەی پسـپۆڕم/ پـیرم و پێیە لە لێوی گۆڕم «سوارە»› ۲. زانا لە پەزناسـیندا 🇮🇷 ۱. مُتخصص ۲. گوسفندشناس

**پسپۆڕی** / pispořî/: ناو. چازانی؛ هۆزان لە کارێکـا 🇮🇷 خبرگی؛ تخصص

**پسپێری** / pispêrî/: ناو. پێش‌بینی 🇮🇷 پیش‌بینی

**پست** / pist/: ناو. سرتە؛ سرکە 🇮🇷 در گوشی

**پستان** / pistan/: نـاو. فسـتان؛ کراسـی ژنانـە 🇮🇷 پیراهن زنانه

**پسترک** / pist(i)rik/: ☜ **پەیژە**

**پستۆڕ** / pistoř/: ☜ **پرۆفسۆر**

**پستو** / pistû/: ناو. بەرۆک؛ یەخە 🇮🇷 گریبان

**پستە** / piste/: نـاو. ۱. پسە؛ فستق ۲. سرتە؛ چپە 🇮🇷 ۱. پسته ۲. پچ ـ پچ

**پستەبادام** / pistebadam/: ناو. بـادامی کاغـەزی؛ باوی تێکوڵ ناسک 🇮🇷 بادام کاغذی

**پستەبایەم** / pistebayem/: ناو. بـادامی کاغـەزی؛ بادامە گەڵوازە 🇮🇷 بادام کاغذی

**پستەبەهێڤ** / pistebehêv/: ناو. بادامی کاغـەزی؛ بادامە گەڵوازە 🇮🇷 بادام کاغذی

**پستەپست** / pistepist/: دەنگـەناو. سرتەسـرت؛ پچەپچ 🇮🇷 پچ ـ پچ

**پستەق** / pisteq/: ناو. مێوژی خراپ 🇮🇷 مَویز بُنجُل

**پسخاڵ** / pisxał/: ناو. کوڕەخاڵ 🇮🇷 پسردایی

**پسدار** / pisdar/: ناوەڵناو. پزدار؛ ئـاوس 🇮🇷 آبسـتن؛ باردار

**پسدان** / pisdan/: ناو. ۱. ☜ **پزدان** ۲. دەفـر 🇮🇷 ۱. ☜ **پزدان** ۲. ظرف

**پسک**[۱] / pisk/: نـاو. ۱. ☜ **پشیلە** ۲. بسک؛ زولف 🇮🇷 ۱. ☜ **پشیلە** ۲. گیسو

**پسک**[۲]: ناوەڵـناو. پـس؛ تایبەتمەنـدی کەسـێ کـە زمانی باش «س» و «ز» ناهێنێ 🇮🇷 ویژگی کسـی که زبانش «س» و «ز» را درست تلفّظ نمی‌کند

**پسکان** / piskan/: ☜ **ڕاپسان**

**پسکول** / piskûl/: ناو. گولـینگی کڵاو 🇮🇷 منگولەی کلاه

**پسکە** / piske/: نـاو. ۱. سـرتە؛ سـرکە؛ قسـە بـە دەنگی نزم ۲. پارێزی ڕاوچی بۆ نچیر ۳. باڵـەفرە و جریوەجریوی جووچکەمەل کـاتی خـواردن 🇮🇷 ۱. نجوا ۲. خیز شکارچی بـه طـرف شـکار ۳. تقلّـای جوجەی پرنده وقت خوردن

**پسکەباز** / piskebaz/: ناوەڵناو. *[مەجاز]* بـە خـوو و هۆگری دۆستبازی (کچ و کوڕ) 🇮🇷 دخترباز/ پسرباز

**پسـکەبازی** / piskebazî/: نـاو. *[مـەجاز]* ئـــەو کردەوانەی کە کوڕ و کچی لاو بۆ پێوەندی کردن لەگەڵ یەکدا دەیکەن 🇮🇷 دختربازی/ پسربازی

**پسکەپسـک**[۱] / piskepisk/: ناوەڵـکار. دۆخـــی دانەوین تا نێوقەد و ڕۆیشتن ‹پسکەپسـک وە بـان جۆگەکەدا پڕتافیا!› 🇮🇷 نیم‌خیز

**پسکەپسک**[۲]: دەنگەناو. ۱. سرتەسـرت ۲. باڵـەفرە و جیکەجیکی جووچک 🇮🇷 ۱. نجوا ۲. حالـت پـر پـر زدن و سر و صدای جوجەی پرنده

**پسکیان** / pisk(i)yan/: چاوگ. تینەپەڕ. //پسکیایت؛

ئەپسکی؛ بپسکە// ۱. پارێز بردنی ڕاوچی ۲. باڵەفڕە و وەقرەنەمانی جووجکەمەل لە کاتی خواردندا ☰ ۱. خیز برداشتن شکارچی بە سوی شکار ۲. بیقراری کردن جوجەی پرندە هنگام خوردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: پسکیاو/ چاوگی نەرێنی: نەپسکیان

**پسڵ** / pis(i)ł/: ناو. پسڵی؛ لووشە؛ گیادۆخەوا؛ گیادۆخوا؛ گیایەکە لە دۆکلیوی دەکەن ☰ گندنای کوهی

**پسڵی** / pisłî/: ☜ **پسڵ**

**پسمار** / pismar/: ناو. بزمار ☰ میخ

**پسماری** / pismarî/: ناو. بزمارە ☰ میخچە

**پسمام** / pismam/: ناو. پزمام؛ کوڕمام؛ ئامۆزای نێر ☰ پسرعمو

**پسمیران** / pismîran/: ناو. بەچکەبەگ؛ نەجیمزادە ☰ نجیب‌زادە

**پسنچک** / pisinçik/: ناو. پنچک ☰ بوتەی درختی

**پسنگ** / p(i)sing/: ناو. پشیلە؛ پشی ☰ گُربە

**پسۆک** / pisok/: ئاوەڵناو. زووپس؛ ناپتەو ‹... تاکوو مەعلووم بێ تا چ ڕادەییەک پێویستیمان هەیە بە هەموو سەرەداوێک، هەر چەند پسۆک و کورتیش بێ ... «مەسعوود محەمەد»› ☰ سُست

**پسو** / pisû/: ناو. ۱. هەست ۲. کولە؛ کەلە ☰ ۱. احساس ۲. فالگوش

⊡ **پسو گرتەی**: کولە گرتن؛ بە دزییەوە گوێ ڕاگرتن لە قسەی خەڵک ☰ فالگوش ایستادن

**پسولە** / p(i)sûle/: ناو. ۱. بڕوانامە ۲. بەرگە ۳. بلیت ☰ ۱. پروانە ۲. ورقە ۳. بلیط

**پسولەیی** / p(i)sûleyî/: ئاوەڵناو. کارتی؛ پێویست بە کارت ☰ کارتی

**پسە** / p(i)se/: ☜ **پسە ـ۱**

**پسەپس** / p(i)sepis/: دەنگەناو. ۱. تورەتوور ۲. سرتەسرت ☰ ۱. حالت لکنت زبان ۲. پچ ـ پچ

**پسەزەوینی** / p(i)sezewînî/: ☜ **بادام زەوینی**

**پسیار** / pisyar/: ☜ **پرسیار**

**پسیان** / pisyan/: ☜ **پسان**

**پسیزک** / p(i)sîzik/: ☜ **پزیسك**

**پسیک** / p(i)sîk/: ☜ **پشیلە**

**پسینچک** / p(i)sînçik/: ناو. ناوی گیایەکە ☰ گیاهی است

**پسێن**[1] / p(i)sên/: ناو. کڕیار ☰ خریدار

ـ **پسێن**[2]: پاشەوشە. ئەوی دەپسێنێ ‹منی زنجیرپسێن لێرە ئەسیری بسکی جوانێکم/ زەمانە گەرچی ئالۆز و پەشێوە، کەڵ بە موو بەندە! «هێمن»› ☰ ـ گُسَل

ـ **پسێنی** / p(i)sênî-/: پاشەوشە. پساندن؛ قرتاندن ☰ ـ گُسَلی

**پسێوز** / p(i)sêwiz/: ☜ **پسپۆڕ**

**پش**[1] / piş/: ناو. ۱. سپی؛ جەرگی سپی؛ سپیەلاک؛ کیسەی هەناسە ۲. نەخۆشینی گەڵای دار مێو و باخ ☰ ۱. ریە؛ شُش ۲. آفت برگ درختان، بویژە مو

**پش**[2]: ئاوەڵناو. فش؛ فشەڵۆک؛ ناپتەو؛ سست؛ شل و شەوێق ☰ شُل و وِل

**پش**[3]: دەنگ. وشەی دەرکردنی پشیلە ☰ کلمەی راندن گربە

**پشارەش** / p(i)şareş/: ناو. پەشارەش؛ سپڵ؛ ئسپل ☰ طحال

**پشاسپی** / p(i)şas(i)pî/: ناو. سپیەلاک ☰ ریە؛ شُش

**پشافتن** / p(i)şaftin/: ☜ **پشاوتن**

**پشافتە** / p(i)şafte/: ئاوەڵناو. هەڵپشاوتە؛ لۆچوپۆچ ☰ مُچالەشدە

**پشاقیک** / p(i)şaqîk/: ناو. سوێنکە سابوون ☰ ماندەی صابون

**پشان** / p(i)şan/: چاوگ. پژان؛ پژیان ☰ پراکندە

شدن؛ پخش شدن

**پشـاندن / p(i)şandin/**: چـاوگ. پژانـدن ☰ پراکندن؛ افشاندن

**پشاوتن / p(i)şawtin/**: چاوگ. پشافتن؛ گلۆفین؛ هەڵپشاوتن؛ تێکهەڵگوشین و لێکدان ☰ مُچاله کردن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: پشاوتە/ چاوگی نەرێنی: نەپشاوتن

**پشـاوته / p(i)şawte/**: ناوەڵناو. هەڵپشاوتە؛ تێکهەڵگوشراو و لێکدراو ☰ مُچاله شده

**پشبەن / pişben/**: ناو. شەوژەن؛ کلۆم ☰ کلون

**پش ـ پش / piş piş/**: دەنگ. وشەی پشیله بانگ کردن ☰ کلمەی صدا کردن گربه

**پشپشۆکە / pişp(i)şoke/**: ناو. گیایەکە لە کلکە پشیله ئەچێ ☰ گیاهی است شبیه به دُم گربه

**پشپشیان / pişpişyan/**: چاوگ. پشلیان؛ هەلاتن (هەویر) ☰ ورآمدن (خمیر)

**پشپێنت / pişpênt/**: ☜ **پژێن ـ١**

**پشت[1] / pişt/**: ناو. پێشت: ١. مازی؛ مێنە؛ پوق؛ ڕەت؛ بەشێک لە لەش کە لەو دیوی سنگ و سکدایە ‹پشتم دەیشێ› ٢. مێنە؛ پوق؛ ڕەت؛ ئەو دیو؛ ئەو بەشەی لە شت کە پێچەوانەی بەرە ‹پشتی پارچە› ٣. مێنە؛ پوق؛ ڕەت؛ ئەو ڕووی؛ ئەو دیوی هەر شتێ ‹پشتی کێو› ٤. بنەچەک؛ ڕەگ؛ تۆرەمە ‹من و تۆ لە یەک پشتین› ٥. دوا؛ دوما؛ دما؛ لای پشتەوە ‹پشتت با بێ و بەرت کەندەلان «مەسەل»› ٦. /مەجاز/ پشتیوان؛ پشتمێر ‹نایێن ب شەرافەتا وی تشتەک/ نینن ژ مە را ژ بل وی پشتەک «خانی»› ٧. /مەجاز/ بنیات و پالپشت ‹پشتم کێو بێ و دوژمنم دێو بێ «مەسەل»› ☰ ١. پُشت؛ مقابل شکم ٢. پُشت؛ مقابل رو ٣. پشت؛ سوی دیگر ۴. پُشت؛ نژاد ۵. عقب ۶. پشتیبان؛ کمک ۷. تکیه‌گاه؛ پناه

⊡ **پشت پێ بەستن**: /مەجاز/ پاڵ پێوە دان؛ خاترجەم بوون لە یارمەتی کەسێک ‹ئەشرافمان هەموو بێ ڕۆح و سستن/ دەخیلە پشتیان هیچ پێ مەبەستن! «بێکەس»› ☰ تکیه کردن

**پشت پێوە دان**: پاڵ پێوە دان ☰ تکیه دادن

**پشت تێکردن**: پشت لێ کردن: ١. ڕوو لێ وەرگێڕان ٢. /مەجاز/ گوێ پێ نەدان ٣. /مەجاز/ دەست لە یارمەتی دان هەڵگرتن ☰ ١. پشت کردن ٢. بی‌اعتنایی کردن ٣. قطع کمک کردن

**پشت دان**: ١. هەڵاتن لە بەر دوژمن ٢. ڕێ پێ دانی مێوینە بۆ نێر ☰ ١. فرار کردن ٢. تمکین کردن ماده در برابر نر

**پشت دانەوە**: /مەجاز/ پاڵ دانەوە؛ پا داکێشان؛ ئارخەیان و بێ‌خەم بوون ☰ آرامش یافتن

**پشت ڕاست کردنەوە**: /کینایە/ ١. ڕزگار بوون لە ژێر باری قەرز، بەڵا و... ٢. چەسپاندن؛ بە بەڵگەوە سەلماندن ٣. پەسند کردن؛ ئەرێ لێ دان ☰ ١. آسایش یافتن ٢. اثبات کردن ٣. تأیید کردن

**پشت سارد بوونەوە**: /مەجاز/ سست بوونەوە؛ دڵسارد بوونەوە؛ بە هۆی بەین کەوتنی کار یان هەرچی، تووشی سستی بوون ☰ مأیوس شدن

**پشت شکان**: ١. شکانی پشت ٢. /کینایە/ پشتیوان نەمان و دەسەڵات لە دەست دان ‹دەسەڵات هەر کە هێزی چەکدار پشتی تێ کرد، پشتی شکا› ٣. /کینایە/ تووشی ئازاری سەختی دەروونی بوون، بە هۆی کارەساتێکەوە ‹کوڕەکەی کە مرد، پشتی شکا› ☰ ١. شکستن پُشت ٢. پشت خالی شدن؛ حامی از دست دادن ٣. کمر شکستن؛ گرفتار مشکل بزرگی شدن

**پشت شکانن**: ١. شکاندنی پشت ٢. /مەجاز/ ناوەڕاستی بار (ڕەشکە، جەواڵ و ...) چاڵ کردن بۆ ئەوەی لە سەر پشتی بارەبەرەوە خۆش جێ بگرێ ٣. /کینایە/ تووشی ئازاری سەخت کردن

‹تیدا چوونی کوڕەکەی پشتی شکاند› ☰ ۱. شکستن پشت ۲. گود کردن وسط بار روی پشت باربر ۳. کمر شکستن

**پشت قورس بوون**:[مەجاز] پشت ئەستوور بوون؛ دارای پشتیوانی بەهێز بوون ☰ پُشتگرم بودن از داشتن پشتیبان

**پشت گرتن**:[مەجاز] یارمەتی دان؛ داژداری کردن ☰ حمایت کردن

**پشتگەرم بوون**:[مەجاز] هیوادار بوون بە هێز و دەسەلاتێک بۆ فریا کەوتن ☰ پُشتگرم بودن

**پشت لە ئەرز دان**: ۱. لە یاری زۆرانبازیدا، پشتی ڕکابەر لە زەوی دان ۲.[مەجاز] بەزاندن ☰ ۱. ضربه فنی کردن ۲. شکست دادن

**پشت لێدانەوە**:[مەجاز] ئاسوودە بوون؛ حەسانەوە ☰ آسودن

**پشت لێکردن**: ☜ **پشت تێکردن**

**پشت لێکردنەوە**: پشت لێدانەوە ☰ آسودن

**پشت لێهەڵکردن**:[مەجاز] دەست لە یارمەتی دان هەڵگرتن ☰ پُشت کردن؛ دست از حمایت کشیدن

**پشت هەڵکردن**: ۱. ڕوو وەرگێڕان ۲. قەڵس بوون ☰ ۱. پشت کردن ۲. عصبانی شدن

**پشت**[2]: ئاوەڵناو. داژدار و لاگر ‹برا پشتی برا بێ، بەلا مەگەر لە خوا بێ «مەسەل»› ☰ طرفدار

**پشت**[3]: دەنگ. ختە؛ فس؛ وشەی دەرکردنی پشیلە ☰ پیشته

**پشت**[4]: ئامراز. لە پشتی؛ لە پشتەوەی ‹پشت من دانیشت؛ پشت ماڵ ئێمەیە› ☰ عقبِ

**پشت ـ**[5]: پێشوشە. ۱. هاریکار؛ یاریدەر ‹پشتمێو› ۲. دوای کار یان ڕووداوێک ‹پشتەپەلە› ۳. هەڵکەوتوو لە پشتەوە ‹پشتهەیوان› ٤. تایبەت بە پشت ‹پشتەمەلە› ☰ ۱. کمک ـ ۲. پس ـ ۳. پشت ۴. ویژەی پُشت

**پشتئەستوور** / pişt'estûr/: ئاوەڵناو. [مەجاز] پشتەسوور؛ خاترجەم؛ دڵنیا ☰ پشتگرم

**پشتئێشە** / pişt'êşe/: ناو. ئێشی پشت و ناوقەد ☰ کمردرد

**پشتاش** / piştaş/: ناو. تۆز ئاسیاو؛ تۆزی ئارد لە ئاشدا ☰ گردِ آسیاب

**پشتان** / piştan/: ئاوەڵناو. ئاوقا؛ دەستەوملان ‹خلخالی قەدم وەک خەمی زولفەینی سەراپات/ پشتانی قەدت بێت و فیدای بازنی بازووت «نالی»› ☰ در آغوش

**پشتاو** / piştaw/: ناو. ۱. جۆرێ دەمانچەی قەدیم ۲. توورەکەی باروتی ڕاوچی ☰ ۱. نوعی تپانچه ۲. توبرەی باروت

**پشتاوپشت**[1] / piştawpişt/: ناو. بنەچەک؛ ڕەگ؛ تۆرەمە ‹ئێمە دەبێ پشتاوپشتی خۆ بناسین› ☰ پشت بر پشت؛ نژاد

**پشتاوپشت**[2]: ئاوەڵکار. بەرەو دوا ‹پشتاوپشت چوو دای لە ماشینێک› ☰ عقب ـ عقب

**پشتبەخوسار** / piştbexûsar/: ناو. [مەجاز] سیخوار لە پشت؛ کەروێشکی قەڵەوی پاییزان ☰ خرگوش فربەی پاییزی

**پشتبەسێڵ** / piştbesêł/: ناو. جۆرێ کولێرەی ساجی ☰ نوعی گردەی ساجی

**پشتبێن** / piştbên/: ☜ **پزبێن ـ۱**

**پشتچاڤ** / piştçav/: ناو. پێڵوو ☰ پلک چشم

**پشتچەماو** / piştçemaw/: ☜ **پشتکوڕ**

**پشتچەماوەیی** / piştçemaweyî/: ناو. قۆزی؛ پشتکۆمی ☰ کوژی

**پشتچەمیو** / piştçemîw/: ☜ **پشتکوڕ**

**پشتخوز** / piştxûz/: ☜ **پشتکوڕ**

**پشتخویل** / piştxûyl/: ☜ **پشتکوڕ**

**پشتدار** / piştdar/: ئاوەڵناو. ۱. قایم؛ پتەو ۲. [کینایە] خاوەن داژدار و لاگری بەهێز و دەسەلات

☰ ١. مُحكم ٢. دارای حامی كلفت

**پشتدەرپەڕیو** / piştderpeřîw/: ناوەلناو. قۆق؛ کۆم ☰ کوژپشت

**پشتدەرپەڕیوی** / piştderpeřîwî/: ناو. قۆقی؛ کۆمی؛ چەمیاوی؛ چەمیاگی ☰ قوزی؛ پشت خمیدگی

**پشتدەرکانە** / piştderkane/: ناو. پشتەدەرێ؛ دابێکی کۆنی کوردەوارییە، کاتی زەماوەند ژنێک دەچووە پشت دەرگای ژووری بووک و تا شتێکیان پێ نەدایە نەیدەهێشت بێتە دەر ☰ از رسوم کُهن عروسی

**پشتڕاست** / piştřast/: ناوەلناو. پشتگەرم؛ دلگەرم ☰ دلگرم

**پشترێژ** / piştřêj/: ناو. پشتەرێژە؛ پشتەرێشە؛ پشترێش؛ برینی پشتی یەکسم ☰ زخم پُشت ستور

**پشترێش** / piştřêş/: ☜ **پشترێژ**

**پشتشکێنە** / piştş(i)kêne/: ☜ **پشتەشکێنە**

**پشتقورس** / piştqurs/: ☜ **پشتگەرم**

**پشتک** / piştik/: ناو. پشتوێن ☰ شال کمر

**پشتکۆڵ** / piştkoł/: ناو. پشکۆڵ؛ داری پشت دەرگا بۆ داخستن ☰ کلون

**پشتکۆم** / piştkom/: ☜ **پشتکوڕ**

**پشتکوڕ** / piştkûř/: ناوەلناو. پشتکۆم؛ پشتخووز؛ پشکووڕ؛ پشتخوویل؛ پشتچەمیو؛ پشتچەماو؛ پشکووژ ☰ کوژپشت

**پشتکول** / piştkûl/: ☜ **پشکەڵ**

**پشتگر**[1] / piştgir/: ناو. مامان ☰ ماما

**پشتگر**[2]: ناوەلناو. لایەنگر؛ یاریدەدەر ☰ حامی

**پشتگری** / piştg(i)rî/: ناو. پشتەڤانی؛ هۆگری؛ یارمەتی ☰ حمایت

**پشتگورد** / piştgurd/: ناو. تەختەیەکی درێژە دەیخەنە نێوەڕاستی ڕایەڵی فەرشەوە و تاڵەکانی پێ گورد و واز دەکەن ☰ تختەی بلند میان تارهای فرش در دارقالی

**پشتگوێ** / piştg(i)wê/: ↓

⊡ **پشتگوێ خستن**: [مەجاز] گوێ پێنەدان؛ وە دوا خستن ‹غولامانە سەرم دانا لە بەر پێیا، وەکوو زولفی/ کەچی ئەو هەر منی خستۆتە پشتگوێ وەک غولامانە «مەحوی»› ☰ پشت گوش انداختن

**پشتگوێ کردن**: ١. سەر چاک کردن ٢. موو هەلگرتنی لاملی ژن ٣. پشتگوێچکە کردن؛ خوێن گرتن لە پشتی گوێ ☰ ١. اصلاح کردن مو ٢. گرفتن موی گردن زنان ٣. حجامت کردن پشت گوش

**پشتگوێچکە** / piştgiwêçke/: ↓

⊡ **پشتگوێچکە کردن**: ☜ **پشتگوێ کردن ـ٣**

**پشتگەرم** / piştgerm/: ناوەلناو. پشتقورس: ١. دلگەرم؛ بەهیوا ٢. ئەرخەیان لە کۆمەکی پشتیوان ☰ ١. امیدوار ٢. پُشتگرم

**پشتگین**[1] / piştgîn/: ناوەلناو. ١. دوماهی؛ ئاخری ٢. پشتی؛ لە پشتەوە جێگیر بوو ☰ ١. واپسین ٢. پُشت سری

**پشتگین**[2]: جیناو. ئاخرین؛ پشتی ‹پشتگینەکە قاوی نۆرەی نەکەفت!› ☰ عقبی

**پشتماز** / piştmaz/: ☜ **پشتەمازە**

**پشتمازە** / piştmaze/: ☜ **پشتەمازە**

**پشتماسیلکە** / piştmasîlke/: ناو. جۆرێک تەقەڵ ☰ نوعی بخیە

**پشتمێر** / piştmêr/: ناو. پشتەمێر؛ هاریکار؛ یاریدەدەر ☰ یاری‌کنندە

**پشتوپاڵ** / pişt û pał/: ناوەلناو. پشتیوان؛ یاریدەدەر ‹ئەوی هاوسەنگەر و پشتوپالمە/ دیاری دا دیاری برەی ناپالمە! «هێمن»› ☰ پشتوپناە

**پشتوپەنا** / pişt û pena/: ناو. پشتیوان؛ پالپشت؛ جێ دالدە و پەنا ‹تۆ دەزانی ئەوی کوشتت چ بوو؟

کێ بوو؟/ پێشمەرگە بوو، پشت‌وپەنا و تێشووی ڕێ بوو «پەشێو»› ☰ پشت‌وپناه

**پشتورو** / pişt û řû/: ئاوەڵناو. ئاوەژوو؛ بەراوەژوو؛ واژی ☰ وارونه

**پشتوێن** / pişt(i)wên/: ☜ **پژبێن ـ١**

**پشتۆنی** / pistonî/: ☜ **پژبێن ـ١**

**پشتو** / piştû/: ناو. دەمانچە؛ شەشلوول ☰ تپانچه

**پشتوری** / piştûrî/: ناو. ورە؛ هێزی دڵ ☰ قوت قلب

**پشتە**[١] / pişte/: ناو. ١. کۆڵوبار؛ باری کۆڵ ٢. پک؛ لای کووڕی میچ؛ جک لە سەر زک ٣. ڕەوتی تێکوڵ فڕێ دانی زام، بەتایبەت ئاوڵە ☰ ١. کولەبار ٢. طرف برجستەی شتالنگ ٣. پوستاندازی زخم

**پشتە**[٢]: ئاوەڵناو. ١. بەپشت؛ نێری گاندەر ٢. هاوپشت؛ هاوخوێن ☰ ١. مرد مفعول ٢. همخون

**پشتە**[٣]: دەنگ. وشەی دەرکردنی پشیلە ☰ پیشته

**پشتەپا** / piştepa/: ناو. پشتەپێ؛ شەق؛ شەپ ☰ تیپا

**پشتەپەل** / piştepel/: ئاوەڵناو. ڕوودار؛ بێشەرم ☰ پُررو

⊡ **پشتەپەل وێستان**: ڕوودارانە لە هەمبەر کەسێکی گەورەتر لە خۆدا وێستان ☰ در برابر بزرگتر از خود ایستادن.

**پشتەپەڵە** / piştepeļe/: ناو. دووهەمین بارانی پەڵە لە پایزدا ☰ دومین باران پاییزی

**پشتەپێ** / piştepê/: ☜ **پشتەپا**

**پشتەدەرێ** / piştederê/: ☜ **پشتدەرکانە**

**پشتەڕێژە** / pişteřêje/: ☜ **پشترێژ**

**پشتەڕێشە** / pişteřêşe/: ☜ **پشترێژ**

**پشتەسور** / piştesûr/: ☜ **پشتئەستور**

**پشتەسەرە** / piştesere/: ☜ **پاشەسەر**

**پشتەشکێنە** / piştes(i)kêne/: ئاوەڵناو. پشت‌شکێنە؛ نارێک لەگەڵ پشتدا؛ تایبەتمەندی بارێ کە دروست و بە باری خۆیدا نەنراوەتە سەر پشتی بارەبەر ☰ حالت باری که درست بر پشت باربر قرار نگرفته

**پشتەڤانی** / piştevanî/: ☜ **پشت‌گری**

**پشتەک** / piştek/: ناو. ١. پشتکۆڵ؛ پشتیوانەی دیوار و دار بۆ قایم بوون ٢. تیسکە خوریی سەر پشتی بەران کە بۆ جوانی دەیهێڵنەوە ٣. مەلەق؛ سەرمەقولات ٤. پشکە؛ پاشکۆ؛ تەرک ☰ ١. پشتیبانه ٢. پشمی که بر پشت قوچ باقی می‌گذارند ٣. پُشتک ۴. ترک؛ عقب

**پشتەکی** / piştekî/: ناو. سواری لە سەر پشتی یەکسم ‹دوو پشتەکی› ☰ سواری بر پُشت ستور

**پشتەلێفە** / piştelêfe/: ناو. ڕووبەر ☰ پُشت لحاف

**پشتەڵپشت**[١] / piştełpişt/: ئاوەڵناو. پشتاوپشت ‹عەیبەن پەی مەن و خانەوادەم گشت/ مەبان وە تانەی نەجدی پشتەڵپشت «خانای قوبادی»› ☰ پُشت بر پُشت

**پشتەڵپشت**[٢]: ئاوەڵکار. پاشەوپاش؛ بەرەو پشت ☰ عقب ـ عقب

**پشتەمازە** / piştemaze/: ناو. پشتماز؛ پشت‌مازە: ١. مۆغەرەی پشت؛ تیغەرەی پشت ٢. گۆشت و ماسوولکەی پەنا مۆغەرە ‹کیلۆیەک پشتەمازەم ساند› ☰ ١. ستون فقرات ٢. گوشت راسته

**پشتەماسی** / piştemasî/: ناو. کۆماج؛ خەرپشتە؛ سەربانی کووڕەک ☰ خرپُشتەی بام

**پشتەماڵ** / piştemał/: ناو. هاوڵە؛ خاولی؛ مەرحەمە ☰ حوله

**پشتەمل** / piştemil/: ناو. کافا؛ بۆقەتە؛ قۆڕک؛ کۆرت؛ کات؛ کاتات ☰ پُشت گردن

**پشتەملە**[١] / piştem(i)le/: ناو. پشتەملێ: ١. بێگار؛ کاری بە زۆرداری بۆ زۆردار ٢. پاشملە ☰ ١. بیگاری ٢. غیبت

**پشتەمله**[٢]: ئاوەڵناو. پشتەسەر ‹قسەی پشتەمله عاجزی دێنێ› 🇮🇷 پُشت‌سری

**پشتەملێ / piştem(i)lê/**: ☜ **پشتەمله**

**پشتەمەلە / piştemele/**: ناو. جۆرێ سۆبایی؛ مەلەی لە سەر گازی پشت 🇮🇷 شنای پُشت

**پشتەمێر / piştemêr/**: ☜ **پشتمێر**

**پشتەوپشت / piştewpişt/**: ☜ **پاشەوپاش**[٢]

**پشتەوڕوو / piştewřû/**: ئاوەڵناو. بەرەوپاش؛ پاشەوپاش 🇮🇷 وارونه

**پشتەوقەفا / piştewqefa/**: ☜ **پشتەوقەفار**

**پشتەوقەفار / piştewqefar/**: ئاوەڵکار. پشتەوقەفا؛ لە سەر پشت ‹پشتەوقەفار خۆی ڕاکشابوو› 🇮🇷 تاقباز

**پشتەوە / piştewe/**: ئاوەڵکار. دواوە ‹وەرە پشتەوە› 🇮🇷 عقب

▣ **لە پشتەوە** لە پشتۆ 🇮🇷 از پشت؛ از عقب

**پشتەوەشکێن / pişteweş(i)kên/**: ئاوەڵکار. بە لای پشتەوەدا چەماو 🇮🇷 به پشت خم شده

▣ **پشتەوشکن کردن** چەماندنەوەی حەریف لە زۆرانبازی و شەڕی دەستەویەخەدا بەرەوپشت 🇮🇷 به پشت خم کردن حریف

**پشتەیوان / pişteywan/**: ☜ **پشتهەیوان**

**پشتهەیوان / piştheywan/**: ناو. پشتەیوان؛ ئۆدەی لە ڕووی هەیوان 🇮🇷 اتاق رو به تراس

**پشتی**[١] **/ piştî/**: ناو. ١. سەرین ٢. پاڵەوپشت؛ ئەوەی پاڵی پێوە دەدەن ٣. کۆڵ؛ باری پشت 🇮🇷 ١. بالش ٢. پُشتی ٣. کوله‌بار

**پشتی**[٢]: ئامراز. دوای؛ لە دوای؛ لە شوێن ‹پشتی تۆ من دێم› 🇮🇷 پُشتِ سرِ؛ به دنبالِ

**پشتیر / piştîr/**: ناو. پشتێر؛ تەویلە؛ تەولە؛ گەوەڕ؛ گەوڕ 🇮🇷 طویله؛ اصطبل

**پشتیوان / piştîwan/**: ناو. ١. هاریکار؛ یاریدەر ٢. قایم‌کەری دیواری شکست ٣. داری درگا داخستن 🇮🇷 ١. پشتیبان ٢. پشت‌بند دیوار ٣. کلون در

**پشتیوانە / piştîwane/**: ناو. دیواری دیوار ئەستێنەوە 🇮🇷 پشت‌بند دیوار

**پشتیوانی / piştîwanî/**: ناو. هاریکاری؛ لاگیری 🇮🇷 پشتیبانی

▣ **پشتیوانی کردن** داژداری کردن؛ لاگیری کردن 🇮🇷 پشتیبانی کردن

**پشتێر / piştêr/**: ☜ **پشتیر**

**پشتێن / piştên/**: ناو. ١. ☜ **پــۆزێن ـ١** ٢. گشتەک؛ بەنی بادراو 🇮🇷 ١. ☜ **پۆزێن ـ١** ٢. نخ تابیده

**پشتێند / piştênd/**: ☜ **پۆزێن ـ١**

**پشتێندە / piştênde/**: ناو. پشتێنە: ١. دەورە؛ کەمەربەندی؛ ئەوەی وەکوو پشتوێن دەوری شتێک دەگرێ ٢. داری دە ناو شووڵی چەپەر خراو ٣. جۆرێ زۆرەوانییە کە دەست دە کەمبەری یەکتر دەگرن ٤. *[مەجاز]* نێوقەد؛ کەمەر ٥. تەوقی ئاسن 🇮🇷 ١. کمربند ٢. پود پرچین ٣. کُشتی باچوخه ۴. کمر ۵. طوق آهنی

**پشتێنە / piştêne/**: ☜ **پشتێندە**

**پشڕوون / pişřûn/**: ناو. چێشتی پیرخەنیلە؛ شیوی وردەساوار 🇮🇷 آش بلغور

**پشقاندن / pişqandin/**: چاوگ. مشقنای؛ دەنگ دەرهێنانی برێ گەانەوەر، وەک ئاسک 🇮🇷 صدا ایجاد کردن حیوانات از جمله آهو

**پشقل / pişqil/**: ☜ **پشکەڵ**

**پشقڵ / pişqił/**: ☜ **پشکەڵ**

**پشقنای / pişqnay/**: چاوگ. فیشقاندن 🇮🇷 فوران کردن

**پشقەڵ / pişqeł/**: ☜ **پشکەڵ**

**پشک / pişk/**: ناو. ١. گولووک؛ خونچەی گوڵی دار ٢. چرۆ؛ گۆپکەی دار ٣. پژک؛ داری کون‌گری مەشکە و خیگە ‹دگان شاش و واش

وەک پشکی بە مەشکە «فولکلۆر»› ٤. دەنکی بەفر؛ کلووی بەفر ٥. قورعە؛ لاتار؛ پسوولەی خۆوبەخت ٦. بەش و پار ‹بە پشکێ ڕازییە قازی لە هەر مالی کە دووپشکە/ لە مالی خۆی لە بۆ خەلکی هەمیشە حیسە دووپشکە «حەریق»› ٧. پریشکی ئاو ٨. قوڕە؛ قورعە ◼ ١. شکوفە ٢. جوانەی درخت ٣. پینەی چوبین مَشک ۴. دانەی برف ۵. بلیط بختآزمایی ۶ سهم؛ قسمت ٧. پشنگ آب ٨ قُرعە

⊡ **پشک خستن:** قورعە کێشان ‹پشک بخەین بزانین بەر کێ دەکەوێ› ◼ قُرعە انداختن

**پشک دەرهاتن:** بردنەوەی کێبەرکێی پشک خستن ◼ قُرعە (بە نام کسی) افتادن

**پشکاندن** / pişkandin/: چاوگ. ١. پشمین؛ پژمین ٢. ☜ **پشکنین** ◼ ١. عطسە کردن ٢. ☜ **پشکنین**

**پشکانی** / pişkanî/: ناو. وشکی؛ هشکی ◼ خشکی

**پشکاوتن** / pişkawtin/: چاوگ. هەلوەشاندنەوەی چندراو یا تەقەل ◼ شکافتن

**پشکسال** / pişksał/: ناو. وەرز؛ کەژ ◼ فصل

**پشکڤین** / pişk(i)vîn/: چاوگ. ١. پشکووتنی غونچە ٢. هەلپشکووتن؛ هەلوەشانی دروومان ◼ ١. شکفتن غنچە ٢. باز شدن بخیە

**پشکل** / pişkił/: ☜ **پشکەل**

**• پشکن** / pişkin-/: پاشەوشە. ـ پشکێن؛ پێداگەڕ ‹توولەڕێی باریک، تووناوتوونپشکن/ ڕێبوار ئەخاتە ئەندێشەی بێبن «گۆران»› ◼ ـ پوی

**پشکنەر** / pişkner/: ناو. پشکێنەر؛ موفەتیش؛ ئەوەی بۆ دۆزینەوەی شتێک، جێگە یان کەلوپەلی کەسێک سەنگوسۆژن دەکا ◼ بازرس

**پشکنین** / pişk(i)nîn/: چاوگ. تێپەر. //پشکنیت؛ دەپشکنی؛ بپشکنە// پشکوین؛ پشکاندن: ١. پێداگەڕان ‹ئەغلەبەی تەکیە و دەرگاهی بیلادی ڕۆمم/ پشکنی، دی چەلەبی هەر جەلەبی بوو، دەدەدەدە! «مەحوی»› ٢. هەلوەشاندن و لە بەر یەک جیا کردنەوەی خوری و لۆکە ‹خورییەکە بپشکنە!› ٣. تێداگەڕان ‹هەموو کەلێن و کولێنی جانتاکەم پشکنی، نەمدۆزیەوە› ◼ ١. کاویدن؛ تفتیش کردن ٢. حلاجی کردن پشم و مو ٣. در چیزی گشتن

◼ ئاوەلناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپشکنین

**پشکنینەوە** / pişk(i)nînewe/: ☜ **پشکوینەوە**

**پشکوان** / pişk(i)wan/: چاوگ. پشکێوان: ١. پشکووتن ‹باغچەمان سەرانسەر گولی ئەپشکوێ/ بلبلمان فێر ئەبێ بە ئاوازەی نوێ «گۆران»› ٢. سوور هەلگەڕان و زیپکە کردنی پێست ‹هەموو لێوم پشکووتووە› ◼ ١. شکفتن ٢. مُلتهب شدن و جوش زدن پوست

◼ ئاوەلناوی بەرکاری: پشکواو/ چاوگی نەرێنی: نەپشکوان

**پشکواندن** / pişk(i)wandin/: چاوگ. ١. بوونە هۆی پشکووتن ٢. *[کیایە]* کردنەوە ‹لێوی بە پرسشی چ نەخۆشێ نەپشکواند/ دەردا تەبیبی ئێمە کە نادا دەوا بە کەس «مەحوی»› ◼ ١. شکوفاندن ٢. گشودن

**پشکوژ** / pişkuj/: ☜ **پشکۆژ**

**پشکول** / pişkul/: ئاوەلناو. تەژەی ناقۆلا ◼ لندهور

**پشکونارنج** / pişk(i)wenarinc/: ناو. بەهارنارنج؛ گولەنارنج؛ گولی داری نارنج کە لە عەترسازی و بۆ مرەبا بە کار دێ ◼ بهارنارنج

**پشکوین** / pişkwîn/: ☜ **پشکنین**

**پشکۆ** / pişko/: ناو. ١. پۆلوو؛ پەرەنگ؛ سکل؛ پەنگر ‹زولفت کە لە سەر ڕوو بە خەم و تابشە ئەمڕۆ/ دوودی سییەهی عوودە لە سەر عاریزی پشکۆ «نالی»› ٢. پشک ◼ ١. اخگر ٢. جوانە

⊡ **پشکۆ دان:** چرۆ کردن؛ پشکۆ دەردان ◼ جوانە

زدن

**پشکۆدان** / pişkodan/: ناو. ئاوردان ☰ آتشدان

**پشکۆژ** / pişkoj/: ناو. پشکۆژە؛ پشکوژ: ۱. خونچە؛ غونچە ۲. دوگمە؛ قۆپچە ۳. گولووک؛ گولی دار ☰ ۱. غُنچه ۲. دُکمه ۳. شکوفه

**پشکۆژە** / pişkoje/: ☜ **پشکۆژ**

**پشکۆڤ** / pişkov/: ناو. خونچە لە کاتی دەمدانەوەدا ☰ غنچەی در حال باز شدن

**پشکۆڵ** / pişkoł/: ناو. ۱. ☜ **پشکەڵ** ۲. ☜ **پشتکۆڵ**

**پشکوتاندن** / pişkûtandin/: چاوگ. تنگنایەوە؛ تەنگنایەوە ☰ شکوفا کردن

**پشکوتن** / pişkûtin/: چاوگ. پشکوون: ۱. وەبوون؛ دەم کردنەوە ‹مەگەر تۆ بووی بە گریەم هاتییە خەندە/ کە گوڵ پشکووت بە دەم هەوری بەهاری «وەفایی»› ۲. سوور هەڵگەڕان و زیپکە کردنی پێست ☰ ۱. شکُفتن ۲. مُلتهب شدن و جوش زدن پوست

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: پشکووتوو/ چاوگی نەرێنی: نەپشکووتن

**پشکوتو** / pişkûtû/: ئاوەڵناو. شکۆفا؛ شکۆفاوە؛ بشکفتی؛ بە شکۆفیانەوە ‹زمانم پشکووتووی قسەی جوانتە/ قسەی ناو گۆرانی شاخەکانتە «گۆران»› ☰ شکوفا

**پشکوڕ** / pişkûř/: ☜ **پشتکوڕ**

**پشکوژ** / pişkûj/: ☜ **پشتکوڕ**

**پشکوک** / pişkûk/: ناو. دوگمە؛ قۆپچە ☰ دُکمه

**پشکوڵ** / pişkûł/: ناو. قوڕ؛ هەڕی؛ حەڕی ☰ گِل

**پشکون** / pişkûn/: ☜ **پشکوتن**

**پشکوناندن** / pişkûnandin/: چاوگ. پشکنین ☰ پوییدن

**پشکونینەوە** / pişkûnînewe/: چاوگ. دۆزینەوە؛ پشکنینەوە؛ هەڵوەشاندنەوە و شی کردنەوە ☰ کاویدن

**پشکە** / pişke/: ناو. ۱. دوا؛ تەرک؛ جێی سوار بوون لە پاشەوە ‹منیان ئەنایە پشکەوە›. بەرانبەر: **بەرکە** ۲. نم؛ تنۆکە ‹وەکوو بیرێکی فەرامۆشکراو/ کە یەک پشکە ئاو نەبێ لە بنیا «پەشێو»› ☰ ۱. تَرک ۲. قطره

▣ **دوپشکە**: دۆخی سوار بوونی دوو کەسی ☰ دو ترکه

**پشکەگوڵ** / pişkeguł/: ناو. بلوێر؛ گیایەکە ☰ بادبیز

**پشکەڵ** / pişkeł/: ناو. پشقل؛ پشقل؛ پشقەڵ؛ پشکل؛ پشکۆڵ؛ بشکول؛ پشتکوول؛ گوشپل؛ کشپەڵ؛ کشپل؛ قشپل؛ تل؛ ڕیخی پەز، بزن و وشتر کە گزموولەیە ☰ پشکل

**پشکیک** / pişkîk/: ناو. چەڵتووک؛ برنجی بە تێکولەوە ☰ شالی

**پشکیل** / pişkîl/: ناو. ۱. ئالقە؛ ئەنگوستیلەی بێنقێم کە لە گاڵتەی کەڵەمستێندا بە کاری دێنن ۲. مازوو؛ ئەو شتە خڕەی گۆرەویبازی پێ دەکەن ☰ ۱. حلقه؛ انگشتری بی‌نگین ۲. تیلەی جوراب بازی

**پشکیلان** / pişkîlan/: ناو. ۱. کەڵەمستێن؛ بازییەکی شەونشینییە، ئەنگوستیلە لە باخەڵی یەکێکدا دەشارنەوە دەستەی تر دەبێ بیدۆزنەوە ۲. سەردانی زاوا و برازاوا بۆ ماڵی بووک لە شەوی شەوگەڕدا ۳. گۆرەویبازی ☰ ۱. نوعی بازی گروهی ۲. رفتن داماد و دوستانش به خانەی عروس شب قبل از عروسی ۳. جوراب‌بازی

**پشکین** / pişkîn/: چاوگ. پژمین؛ پژنژین ☰ عطسه کردن

- **پشکێن** / -pişkên/: ناو. ــــ پشکن؛ پێداگەڕ ‹ماڵ‌پشکێن› ☰ ـ پوی

**پشکێنراو** / pişkênraw/: ئاوەڵناو. هلکەوشاندی ☰

وارسی شده

**پشکێنەر** / pişkêner/: ☜ پشکنەر

**پشکێوان** / piştkêwan/: ☜ پشکوان

**پشلیان** / pişl(i)yan/: ☜ پشپشیان

**پشمای** / pişmay/: چاوگ. پژمین ⇐ عطسه کردن

**پشمنای** / pişmnay/: چاوگ. پژماندن ⇐ به عطسه انداختن

**پشمە** / pişme/: ☜ پژمە

**پشمین** / pişmîn/: ☜ پژمین

**پشنی** / pişnî/: ناو. توێڵ؛ هەنیە؛ ئەنی؛ ناوچاوان ⇐ پیشانی

**پشۆ** / p(i)şo/: ☜ پشیلە

**پشۆر** / p(i)şor/: ناو. پشتەملە؛ کاری خراب گوتنی کەسێ ⇐ بدگویی

**پشۆرە** / p(i)şore/: ناو. کرواس؛ جاوگ؛ جاو؛ جانگ ⇐ کرباس

**پشو** / p(i)şû/: ناو. ١. هەناسە ٢. ☜ پشیلە ٣. وچان ‹تاوێک لامان دا بۆ پشووی ولاخ/ دانیشتن پشتە و دۆڵی قەرەداخ «گۆران»› ⇐ ١. نفس ٢. ☜ پشیلە ٣. استراحت

⊡ **پشو دان**: پشوو گرتن؛ وچان دان ⇐ استراحت کردن

**پشو گرتن**: ☜ پشو دان

**پشووبڕ** / p(i)şûbiř/: ئاوەڵناو. پشووپساو؛ پشووبەماو ‹کەڵپی خوێناوی گر کردن/ فریشتەی پشووبڕ کردن «هێمن»› ⇐ از نفس افتاده

**پشووتەنگ** / p(i)şûteng/: ئاوەڵناو. عەرنۆک؛ دڵناسک ⇐ زودرنج

**پشوودان** / p(i)şûdan/: ناو. تەعتیل ⇐ تعطیل

**پشوودرێژ** / p(i)şûd(i)rêj/: ئاوەڵناو. بە تاقەت؛ بێنفرەه؛ پرزوو؛ بە حەوسەلە ⇐ شکیبا

**پشوودرێژی** / p(i)şûd(i)rêjî/: ناو. پرزوویی؛ بێنفرەهی ⇐ شکیبایی

**پشووسواری** / p(i)şûs(i)warî/: ناو. هەناسەسواری؛ تەنگەنەفەسی. هەروەها: **پشووسوار** ⇐ نفس‌تنگی

**پشوولەسەرخۆ** / p(i)şûleserxo/: ئاوەڵناو. هێدی؛ نەرموو ⇐ صبور

**پشوولەسەرخۆیی** / p(i)şûleserxoyî/: ناو. سەبر؛ سەبووری ⇐ صبوری

**پشوولێبڕ** / p(i)şûlêbiř/: ئاوەڵناو. خنکێنەر ⇐ خفه‌کننده

**پشە** / p(i)şe/: ناو. ١. پریشکی ئاو ٢. سی؛ سیپەلاک ٣. ☜ پشیلە ⇐ ١. قطرات پاشیده‌ی آب ٢. شُش ٣. ☜ پشیلە

**پشی** / p(i)şî/: ناو. ١. ☜ پشیلە ٢. کەپەکی ئارد ٣. سی؛ جگەری سپی ٤. کولیجە بە ڕۆن ‹لەوێ بە گەرما و قرچەی نیوەڕۆ/ دانیشە حەڵوا و پشی بووک بخۆ «گۆران»› ٥. پشوو؛ هەناسە ⇐ ١. ☜ پشیلە ٢. نُخاله‌ی آرد ٣. شُش ٤. نان روغنی ٥. نفس

⊡ **پشی کەفتنە شواڵ**:*[مەجاز]* لە ترسی دەرکەوتنی ڕاستی، ئۆقرە نەمان ⇐ از ترس لو رفتن، بی‌قرار شدن

**پشیان** / pişyan/: چاوگ. پرژانی ئاو؛ پریشکە کردن ⇐ پاشیدن آب

**پشیپایزە** / p(i)şîpayze/: ☜ پەپوولەپایزە

**پشیپاییزە** / p(i)şîpayîze/: ☜ پەپوولەپایزە

**پشیشۆر** / p(i)şîşor/: ☜ پشیلەشۆر

**پشیک** / p(i)şîk/: ☜ پشیلە

**پشیلۆک** / p(i)şîlok/: ☜ پەپوولەپایزە

**پشیلۆکە** / p(i)şîloke/: ☜ پەپوولەپایزە

**پشیلە** / p(i)şîle/: ناو. پشی؛ پشیلێ؛ پشیک؛ پشە؛ پشۆ؛ پشوو؛ پۆشە؛ پسک؛ پسنگ؛ پسیک؛ پسپسیک؛ دهلک؛ ختێ؛ ختک؛ کتک؛ کێتک؛ کەتک؛ کتە؛ کت؛ گیانەوەری گوانداری بچووک و تووکن، بە سەری خڕ، چاوی زل، سمێڵی هەستۆک، گوێی قیت و کلکی درێژەوە کە

لەمێژە کەوی دەستی مرۆ بووە ☰ گُربه

**پشیلە پایزە** / p(i)şîlepayze/: ☜ پەپولەپایزە

**پشیلە پاییزە** / p(i)şîlepayîze/: ☜ پەپولەپایزە

**پشیلەسورە** / p(i)şîlesûre/: ناو. پشیلەسووریَ؛ گەمەیەکی مندالانە ☰ گربەشو

**پشیلەسورێ** / p(i)şîlesûrê/: ☜ پشیلەسورە

**پشیلەشۆر** / p(i)şîleşor/: ناو. [مەجاز] پشی‌شۆر؛ کتک‌شۆر؛ کاری شوشتنی ناتەواو؛ شۆردنی سەرچڵ. هەروەها: **پشیلەشۆر کردن** ☰ گربەشور

**پشیلەکێوی** / p(i)şîlekêwî/: ناو. هووشک؛ گورواسە؛ جۆرێک پشیلەی گەورە و سووری گوێ‌سووک کە کەوی دەستی مرۆ نەبووە ☰ گربەی وحشی

**پشیلێ** / p(i)şîlê/: ☜ پشیلە

**پشێو** / pişêw/: ئاوەڵناو. پەشێو؛ پەرێشان؛ نەباش ☰ پریشان

**پشێونە** / p(i)şêwne/: ☜ بشێونە

**پشێوە** / p(i)şêwe/: ☜ بشێوە

**پشێوی** / p(i)şêwî/: ☜ بشێوی

▣ **پشێوی نانەوە**: کەتن گێڕان؛ ئاژاوە نانەوە ☰ فتنه انگیختن

**پشێوێنی** / p(i)şêwênî/: ناو. پشێوە؛ ئاژاوە ☰ آشوب

**پف**[1] / pif/: ناو. ١. فوو؛ فیش ‹ئاسن سەرد بە پف گەرم ناوێ «مەسەل»› ٢. با؛ هەوا؛ پەنام ‹ژێر چاوی پفی کردگە› ☰ ١. پُف ٢. آماس؛ ورم

▣ **دو پف و سەورێ**: [مەجاز] هیندێک لەسەر خۆ ‹زۆرتر کاتێ دەگوترێ کەسێ بە پەلە شتێکی داخ بخوا و زاری خەریک بێ بسووتێ› ☰ قدری با تأمُّل

▣ **پف دان**: ١. هەلامساندنی مالاتی سەربڕاو ٢. [مەجاز] پێهەڵگوتنی بە درۆ ٣. [مەجاز] هەڵنان؛ هەڵخڕاندن ☰ ١. دمیدن در لاشه ٢. هندوانه زیر بغل زدن ٣. تحریک کردن

**پف دریان**: فوو دران ☰ پُف داده شدن

**پف کردن/ کرن**: ١. فوو کردن ‹پف کە گەشەو بێ!› ٢. با کردن؛ ماسین ‹سەروچاوی پفی کردوو› ☰ ١. دمیدن ٢. باد کردن

**پف/ فو لە دۆ نەکردن**: [کینایە] تێدا نەوەستان؛ بیر لێ نەکردنەوە ‹لە جەردەییشدا نوێژیان تەرک ناکەن/ بۆ هەزار کوشتن پف لە دۆ ناکەن! «پیرەمێرد»› ☰ بدون تأمُّل عمل کردن

**پف لێکردن**: فوو لێ‌کردن ‹... وەک فتیلەی ناو تەویلە، دوای وەی کاریان پێ نەدەمایین، پفێکیان لێ دەکردین و لە دەلاقەیان دادەنایین ... «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ فوت کردن

**پف**[2]: دەنگ. ١. پیف؛ وشەی وەڕەزی لە بۆنی ناخۆش ٢. وشەی گاڵتە بە قەڵەوی زگ‌زل ☰ ١. پیف ٢. پُفی

**پفدانک** / pifdanik/: ناو. پوفلک؛ تیزانگ؛ پزدانی فوودان ☰ بادکُنک

**پفدراو** / pifd(i)raw/: ئاوەڵناو. پفدریاگ: ١. پفەڵدراو؛ بە فوو هەڵمساو ٢. دنەدراو؛ هانەدراو ☰ ١. پُف داده ٢. تحریک شده

**پفدریاگ** / pifdiryag/: ☜ پفدراو

**پفکردو** / pifkirdû/: ئاوەڵناو. گف؛ پف‌گیف ☰ بادکرده

**پفکە** / pifke/: ناو. پفلەک؛ پفلە؛ پفلەکە؛ بلۆق؛ تۆقلە؛ ئاورگ ☰ تاول

**پفکێ** / pifkê/: ئاوەڵناو. [شوورەیی] گوشاد؛ جوێنی ژنانە ☰ دشنام زنانه

**پفلە** / pifle/: ئاوەڵناو. [کینایە] تریاکی؛ تلیاکی ‹کابرایەکی پفلەیە› ☰ تریاکی

**پفلەک** / piflek/: ☜ پفکە

**پفلیان** / pifilyan/: چاوگ. پشلیان؛ پەنەمین؛ ماسین؛ با کردن ☰ باد کردن

**پفڵدان** / pifiłdan/: ناو. میزەڵدان؛ مسوڵدان ☰ مثانه

**پفڵە** / pifłe/: ☜ **پفکە**

**پفڵەکە** / pifłeke/: ☜ **پفکە**

**پفنە** / pifne/: ئاوەڵناو. پفووڵە؛ پکنە؛ کورتەبالای قەڵەو ☰ کوتاەقد چاق

**پفۆک** / p(i)fok/: ناو. ١. باڵۆن ٢. کیسەی پڕ لە بای ناو سکی ماسی ☰ ١. بالُن ٢. کیسه هوای شکم ماهی

**پفوڵە** / p(i)fûłe/: ☜ **پفنە**

**پفە** / p(i)fe/: ناو. چێشت بە زمانی منالان ☰ آش به زبان کودکانه

**پفەک** / p(i)fek/: ناو. ١. ئامرازی فوو تێ‌کردن ٢. پیفۆک؛ چەرەسی سوێر و تورتی منداڵان ٣. خواردنێ لە هێرەڵماسی، هێلکە و خوێ بە شکلی بەرووڵەی کفەڵ دروست دەکرێت ☰ ١. دم؛ ابزار دمیدن ٢. پُفک ٣. از خوراکی‌ها

**پفەڵ** / p(i)feł/: ئاوەڵناو. فشەڵۆک ☰ مُتخلخل

**پفەڵدان** / pifełdan/: چاوگ. فوودان؛ فوو تێکردن ☰ پُف دادن

**پفەڵدراو** / pifełd(i)raw/: ئاوەڵناو. پفدراو؛ فوودراو؛ باتێکراو ☰ پُف داده

**پفیان** / pifyan/: چاوگ. تووڕە بوونی بێ‌دەنگ هەڵبڕین ☰ عصبانی شدن و بروز ندادن

**پفیلک** / p(i)fîlik/: ناو. بلۆق؛ پۆڕگ؛ تۆقلە ☰ تاول

**پفیو** / p(i)fîw/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* لەش‌گران و تەمەڵ ☰ تنەلش

**پفیوز** / pfyuz/: ئاوەڵناو. ناکەس؛ بێ‌غیرەت؛ بێ‌ڕەگ ☰ پُفیوز

**پک** / pik/: ناو. پشتەی جک؛ بەرانبەری چک ☰ حالت بر رو افتادن شتالنگ

**پک . پک** / pik pik/: دەنگەناو. نووزەنووزی منداڵ بە دەم گریانەوە ☰ غرولند بچه موقع گریستن

**پکرنو** / pikiřnû/: ناو. قرنوو؛ پکەوڵە ☰ قراد؛ حشره‌ای کنه مانند

**پکنە** / pikne/: ☜ **پفنە**

**پکە** / p(i)ke/: ناو. پک؛ پشتەی میچ؛ پشتەی قاپ ☰ حالت دمر افتادن شتالنگ

**پکەوڵە** / p(i)kewłe/: ☜ **پکرنو**

**پگر** / pigir/: ناو. گەمرە؛ گەمرە؛ کەمرە؛ گەرمە ☰ سرگین خشک شده

**پل** / pil/: ناو. ١. پەل؛ تکە؛ چنچک؛ قنچک؛ قۆزباشی؛ پارچە گۆشتی چکۆلە ‹لە بەر یەک لوقمە یەک پل گۆشتی مەعسووم/ منت بۆچ کرد لە نووری دیدە مەحرووم؟ «گۆران»› ٢. پەنجە ‹دەست و پلت بشۆ!› ٣. قامک؛ ئەنگووس ٤. خول؛ ڕەوتی باو خواردن ٥. تەزوو؛ چڵ؛ چریسکە؛ چۆنیەتی برووسکە پێداهاتن ٦. چەقەنە ‹پل تەقاندن› ٧. لکی باریکی دار ‹لق و پل› ٨. پەلکە ٩. پێل؛ پرد ١٠. پت؛ ڕەوتی لێدانی ڕەگ ١١. پەل؛ باڵ ١٢. پلک؛ پوور؛ خوشکی باوک ‹پیرێژنێ کچێکی هەبوو جوان و نۆنەمام/ تاقانەیەک، نە باب و برای بوو، نە پل، نە مام «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ١٣. خالتیک؛ خوشکی دایک؛ ١٤. تل؛ خل؛ گل؛ گەوز؛ ڕەوتی بزووتن لە سەر لا ☰ ١. چنجه ٢. پنجه ٣. انگشت ۴. تاب؛ غلت ۵. حالت تیر کشیدن اندام ۶. بشکن ۷. جوانەی نازک درخت ۸. گیسوی بافته ۹. پُل ۱۰. نبض ۱۱. بال ۱۲. عمّه ۱۳. خاله ۱۴. غلت

⊡ **پل پسکیان**: *[مەجاز]* دەست هەڵە کردن ☰ خطای یدی کردن

**پل پێدان**: بە شتێ هەڵگەڕاندنەوە ‹بەردەکەمان بە نوێڵ پل دا› ☰ غلتاندن

**پل تەقاندن**: پل لێدان؛ چەقەنە لێدان ☰ بشکن زدن

**پل دان**: ١. لێدانی نەبز بە توندی ٢. پەڕینی

ئەندام وەک پەڵکی چاو و لێو ۳. پل خـواردن؛ ئەم دیو و ئەو دیو کردن؛ ئەم لا و ئەو لا کردن ‹لە ناو خەودا بۆ ئەوەندە پل ئەدەی؟› ٤. تل دان؛ خستنە سەر لا ‹با ئەم بەردە گەورە پل بەین› ⇐ ۱. زدن سریع نبض ۲. پریـدن اعضـای صـورت ۳. غلت خوردن ۴. غلتاندن

**پل لێدان**: ☜ **پل تەقانن**

**لە پل/ پلە پسکیان**: *[مەجاز]* بـە هەڵـە کارێـک تێک دان ⇐ اشتباهی کاری را خراب کردن

**پلاتفـورم** / p(i)latfurm/: نـاو. ئـەو بەرنامـە و سیاسەتە حیزبیانە کە پێش هەڵبژاردن لە لایـەن ڕێکخراوە حیزبییەکانەوە بانگەشەی بـۆ دەکرێـت بە مەبەستی ڕاکێشانی دەنگی خەڵک ⇐ پلاتفورم

**پلاتین** / p(i)latîn/: ناو. زێڕی سـپی؛ تـوخمێکی کانزایی بەنرخە بە ژمارەی ئـەتومی ۷۸ و کێشـی ئەتومی۱۹۵ کە لە جەواهیرسازی، ددان‌بژیشکی، شکسەبەنی و زۆر پیشەی‌تردا بە کـار دەچـێ ⇐ پلاتین

**پـلار** / p(i)lar/: نـاو. ۱. پلـــلار؛ بــرک؛ پلنـــدار؛ داردەستێ کە بـۆ هاویشـتن دەبـێ ‹زەرەر نـەبێ سەمەرێکی نییە درەختی غەیر/ ئەگەر بە بەرد و پلار سەرچلی بخەیتە خـوار «حـەریق»› ۲. قسـەی بـە تێکـوڵ ۳. تانـە و سـەرکۆنە ⇐ ۱. تکـە چـوب ۲. متلک ۳. سرزنش

⊡ **پلار تێگرتن**: ۱. دار هاویشتن بۆ میوە تەکاندن ۲. قوڵەدار لە کەسێک هەڵکردن ۳. سـەرکۆنە و قسەی بە تێکـوڵ کـردن ⇐ ۱. انـداختن تکـە چوب برای میوەی درخت ۲. چوب بە طرف کسـی پرت کردن ۳. متلک گفتن؛ تعریض زدن/ گفتن

**پلاژ** / p(i)laj/: نـاو. ڕۆخـەوار؛ لێـوار: ۱. شـوێنی تەخت و خۆش‌بەرجەوەندی قەراخی ئاو ۲. مـاڵ و سامانی دروستکراو لەو شوێنەدا ⇐ ۱و۲. پلاژ

**پلاس‌ئـاخوڕ** / p(i)las'axuř/: ناوەڵـناو. *[کینایە، پلار]* تایبەتمەندی ژنـێ کـە شـەرمی گـەورە بێـت ⇐ فرج‌گشاد

**پلاسـتیک** / p(i)lastîk/: نـاو. پەلاسـتیک؛ نـاوی گشتی بۆ زۆرێک بەرهەمی پولیمیری: *ئا)* دەڵـق؛ دڵـق؛ مشـەما؛ جـۆری ناسـک بـە ڕەنگـی جۆراوجۆرەوە (وەک بـۆ سـفرە) *ب)* باغـە؛ جـۆری وشـک و ڕەق (وەک بـۆ قـاپ و کاسـە) *پ)* باتـە؛ لاستیک؛ لاسیق؛ جۆری نـەرم (وەک بـۆ کـەوش) *ت)* قایش؛ بە شێوەی شریتە کە کێشی دێـت ⇐ پلاستیک

**پلاسما** / p(i)lasma/: نـاو. ۱. *[بژیشـکی]* بەشـی تـراوی خـوێن کـە زۆربـەی ئـاوە ۲. *[فیزیک]* چوارەمین حاڵەتی ماک کـە لـە تـینی یـەکجار زۆردا بەدی دێ و تێیدا ئیلکترون لە ناوکی ئەتوم جوێ دەبێتەوە ⇐ ۱. پلاسـمای خـون ۲. پلاسـما، حالت چهارم ماده

**پلاڤ** / p(i)lav/: ☜ **پلاو**

**پلاک** / p(i)lak/: ناو. پـەلاک: ۱. لـەک؛ ژمارگـە؛ تیکەیەکی کانزا، تەختە یان قاقەز کە ژمارەیەکی لە سەر دەنووسرێ ۲. دروشـم؛ لەتـە کانزایـەکی بەنرخ کە نەخشی لە سەر هەڵدەکۆڵن و لە ملـی دەکەن ⇐ ۱و۲. پلاک

**پلاکـارت** / p(i)lakart/: ناو. ۱. وەرەقێکی بە سـەر دارەوەکراو کـە لـە خۆپیشـاندانا بـە دەسـتییەوە دەگـرن ۲. نووسـراوەی بـە سـەر پارچـەوە بـۆ چاوڕۆشنی، ئازیەتباری و... ⇐ ۱و۲. پلاکارد

**پلاکیـت** / p(i)lakît/: نـاو. گردیلـــەی خـــوێن؛ گەردەی وردی پووڵەکەیی ناو خوێن، کـە کـاری گرساندنەوەی خوێنە ⇐ پلاکت

**پلان** / p(i)lan/: ناو. ۱. گەلاڵە؛ بەرنامە؛ پـرۆژە ۲. پـیلان؛ کـەین‌وبـەین بـۆ فـێڵ ۳. نەخشـەی خانووبەرە، ماشین و ... ٤. گرتەیێک لە فیلم کە بە جارێک و بێ‌پسان هەڵدەگیرێت ⇐ ۱. پروژە ۲.

دسیسه ۳. طرح ۴. برداشت (فیلم)

**پلانکتۆن** / p(i)lankton/: ناو. گیانداریکی وردیلەی ناو دەریا کە خۆراکی زۆربەی دەریاژییانە ☰ پلانکتون

**پل‌پل** / pilpil/: ئاوەڵناو. ئەنجناو؛ لەت ـ لەتی چکۆلە ☰ انجیده

⊡ **پل‌پل کردن**: پارچە ـ پارچە کردن ☰ قیمه‌ـقیمه کردن

**پلپلۆک** / pilpilok/: ناو. پەپوولە ☰ پروانه

**پلپلە** / pilp(i)le/: ناو. پیلە؛ خشڵیکە ☰ زیوری است

**پلپۆسەکی** / pilposekî/: ئاوەڵناو. ڕزیو؛ پواو ☰ پوسیده

**پلت** / pilt/: ☜ پەڵە ـ۱

**پلتۆک** / piltok/: ☜ پلتۆک ـ۱

**پل‌تەقینە** / pilteqêne/: ناو. پللە ☰ بشکن

**پلتیک** / piltîk/: ئاوەڵناو. ڕزیو؛ دارزیاگ؛ ڕزیای ☰ پوسیده

**پلچ** / pilç/: ئاوەڵناو. فلچ؛ تلیخاو؛ پلیخاو ☰ لِه

**پلچاندنەوە** / pilçand(i)newe/: چاوگ. فلیقاندنەوە ☰ لِه کردن

**پلچی** / pilçî/: ناو. ۱. بلچ؛ گوێژ ۲. پلیخاوی؛ پان و فلچی ☰ ۱. زالزالک ۲. لِه‌شدگی

**پلژیان** / pilj(i)yan/: چاوگ. سیس بوون ☰ پژمُردن

**پلشت** / pilişt/: ئاوەڵناو. چلکن؛ پلک؛ پیس ☰ پَلَشت

**پلک**[1] / pilk/: ناو. ۱. پوور؛ میمی؛ میمک؛ خوشکی باوک ۲. کەزی؛ پرچ ۳. پل؛ خول؛ تل ☰ ۱. عمّه ۲. گیسو ۳. غلت

**پلک**[2]: ئاوەڵناو. پلشت؛ چلکن؛ گەمار ☰ چرکین

**پلکان** / pilkan/: چاوگ. گلار بوون ☰ غلتیدن

**پلکاندن** / pilkandin/: چاوگ. پلکانن؛ گلاندن ☰ غلتاندن

**پلکاندنەوە** / pilkand(i)newe/: چاوگ. تلاندنەوە؛ خلۆر کردنەوە؛ پل دان ‹کەرە و خوەی ئەپلکێنێتەو «مەسەل»› ☰ غلت دادن

**پلکانن** / pilkanin/: ☜ پلکاندن

**پلکانەوە** / pilkanewe/: چاوگ. گلار بوونەوە ☰ غلتیدن

**پلک‌وپلتور** / pilk û piltûr/: ناو. هەموو ئافرەتانی خزمی دایک و باوک، تایبەت کچە پوور و پوورزا ☰ زنان خویشاوند پدری و مادری، بویژه دخترعمه‌ها و دخترخاله‌ها

**پلکە** / pilke/: ناو. ۱. بسک و کەزی ۲. خوشکی باوک ☰ ۱. گیسو ۲. عمّه

**پلکیان** / pilikyan/: چاوگ. پلکیانەوە: ۱. گلان؛ خلۆر بوونەوە ۲. *[مەجاز]* سەرقاڵ بوون؛ خەریک بوون ‹پلکیام بە کارەوە، لە بیرم چووا› ۳. لێ‌هاڵان؛ پێدا پێچان ‹ئەوندە پلکیا پێما، نەیهێشت کارەکەم بکەم› ☰ ۱. غلتیدن ۲. سرگرم شدن ۳. بە پر و پا پیچیدن

**پلکیانەوە** / pilikyanewe/: ☜ پلکیان

**پللار** / pillar/: ☜ پلار ـ۱

**پللە** / pille/: ناو. پل‌تەقینە؛ پتە ☰ کندوی عسل

**پلم** / pilm/: ئاوەڵناو. پلم؛ گرژ و مۆن ☰ بداخم

**پلماندن** / pilmandin/: چاوگ. بلماندن؛ بۆڵاندن ☰ غرولند کردن

**پلمە** / pilme/: ناو. فرۆ ☰ آغوز

**پلنت** / pilint/: ئاوەڵناو. پیس؛ نەپاکژ ☰ کثیف

**پلند** / pilind/: ناو. دوایین مۆرەغەی برbرەی پشت ☰ دُنبالچه

**پلندار** / pilindar/: ☜ پلار ـ۱

**پل‌وپا** / pil û pa/: ناو. ۱. قاچ و قول؛ لنگ و لەتەر ۲. *[پلار]* حەول و تەقالا ☰ ۱. پر و پاچه ۲. تلاش

**پلوپۆ** / pil û po/: ناو. [مەجاز] وزە و هێز؛ تـوان و تاقەت ☰ تاب و توان

**پلوپووش** / pil û pûş/: ناو. پـڕ و پـووش؛ وشـکە گیا ☰ خُشکه گیاه

**پلوتونیوم** / p(i)lutunyum/: ناو. توخمی کیمیایی کانزایی ڕادیۆئەکتیڤ، لە دەستەی ئاکتینیدەکان، بە ژمارەی ئەتومی ٩٤ ☰ پلوتونیم

**پلورالیزم** / p(i)luralîzm/: نـاو. فرەلایـەنی: ١. ڕێبازێ کە بـڕوای بـە زۆرتـر لـە یـەک یـان دوو ڕاسـتەقینەی سـەرەکی هەیـە ٢. ڕێبـازێکی ڕامیـاری، خوازیـاری کۆمەڵـگای وا کـە هـەموو کەسێک بە هەر جۆرە بیر و بۆچوونێک، لە سـەر هـەر مـەرام و ئایینێـک و خـاوەن هـەر زمـان و فەرهەنگێک، ڕێی هەبێ بـیر و بۆچـوونی خـۆی دەربڕێ و بەشی خۆی لە کۆمەڵگاکەیدا چـالاکی هەبێ ☰ ١و٢. کثرت‌گرایی

**پلوسگر** / p(i)lusgir/: ☜ **پەڕەسێلکە**

**پلوێن** / pilwên/: نـاو. گیاگۆچـان؛ گیاوەگۆچانـە؛ سێبەڕێ؛ سێپەڕ ☰ اکلیل‌الملک

**پلۆخ** / p(i)lox/: ناو. پەلووخ؛ پۆلـوو ‹لـەو هـەرفتم ئەز ژ مەیلێ، شوبهەتێ سیهلێ و سەیلێ/ موحبەت و عیشـقا د لـەیلێ ئـەز کـرم یەکسـەر پلـۆخ «مـەلای جزیری»› ☰ اخگر

**پلۆر** / p(i)lor/: نـاو. هەڵـوای ئـارد و دۆشـاو ☰ حلوای آرد و شیره

**پلۆز** / p(i)loz/: ناو. ١. پرپۆڵە؛ چێشتی گزموولـە هـەویر و کووزەڵـە ٢. گزموولـە هـەویری دانی جووچک ☰ ١. آش اوماج ٢. آرد آبزده و گلوله شـده برای خوراک جوجه

**پلوور** / p(i)lûr/: ناو. ١. بلوێر؛ بلوور؛ نـای ٢. ☜ **پلووسك** ☰ ١. نی‌لبک ٢. ☜ **پلووسك**

**پلوورژەن** / p(i)lûrjen/: ناو. بلوێرژەن؛ بلوێرلێـدەر؛ بلوێربێژ؛ نای‌ژەن ☰ نی‌نواز

**پلوورگە** / p(i)lûrge/: ☜ **پلووسك**

**پلوورو** / p(i)lûrû/: ☜ **پلووسك**

**پلـوورە** / p(i)lûre/: نـاو. ١. خەڵـێف؛ جێگـەی هـەنگ ٢. ☜ **پلووسـك** ٣. شـۆڕەی ئـاو ٤. سەهۆڵی شۆڕەوەبوو لە پلووسک یا ئەشکەوت ☰ ١. کندوی عسل ٢. ☜ **پلووسك** ٣. شُرـ شُـر آب ۴. دنگاله

**پلـوورەمێش** / p(i)lûremêş/: نـاو. پلوورەهـەنگ؛ گوربە؛ کاریتان؛ کەنوو ☰ کندوی عسل

**پلوورەهەنگ** / p(i)lûreheng/: ☜ **پلوورەمێش**

**پلووسک** / p(i)lûsk/: ناو. پلوور؛ پلوورگـە؛ پلـوورە؛ پلووروو؛ سوولک؛ سوولاو؛ سوولاوک؛ سـوولاوکە؛ سـوولاڤ؛ لووسـاو؛ لـووس؛ لووسـاوک؛ سـوول؛ سویل؛ سیل؛ قابوول؛ شوورک؛ بۆخشک؛ چـرک؛ چرروونـەک؛ مێزەفـک؛ میزفـک؛ ئـاوڕێژ؛ ئاوپـەڕ؛ نـاوخوڕ؛ نـاوخوا؛ نـاخوا؛ نـاخوڕە؛ لوولـە یـان کەرسـتەیەکی ناوچـاڵ بـۆ ڕاگـوێزانی ئـاو لـە ڕووبەرێکیـەوە بـۆ ڕووبـەرێکی‌تـر، بەتایبـەت لـە سەربانەوە بۆ خوار ‹دەبینی یەک ئـەوە مەشغوولـی هەڵگێڕانەوەی بانە/ ئەوەی تر دادەمەزرێنێ پلووسـک و چۆتە گوێسوانە «هێمن»› ☰ ناودان

**پلووسکە** / p(i)lûske/: نـاو. گەروولـەی ئـاش ☰ گلوی گندم ریز آسیا

**پلووسگرد** / p(i)lûsgird/: ☜ **پەڕەسێلکە**

**پلـووک** / p(i)lûk/: ناو. کلۆ ‹پلووکێ قەندم بدەیـە!› ☰ حبّه

**پلووکەبـەرد** / p(i)lûkeberd/: نـاو. وردەبـەرد ☰ خُردەسنگ

**پلوول** / p(i)lûl/: ناو. بلوور؛ بلوێر ☰ نی‌لبک

**پله** / p(i)le/: ناو. ١. پوور؛ میمک؛ میمی؛ مـەتی؛ خوشـکی بـاوک ٢. پلـەک؛ دەرەجـە ٣. [مەجاز] پلەوپایـە ٤. هـەل؛ دەرفـەت ٥. پـێ‌پلیکـەی نەردیوان ٦. پتە؛ کاری بە قامک لە شـت دان ٧.

*[مەجاز]* قۆناغ 🇮🇷 ١. عمّه ٢. درجه ٣. مقام ٤. فرصت ٥. پلّه ۶. تلنگر ٧. مرحله

▣ **پلە بۆ هەڵکەفتن:** دەرفەت بۆ ڕەخسان ‹کاکەم پلەیێکی بۆ هەڵکەفت ماڵێکی سەند› 🇮🇷 فُرصت دست دادن

**پلە ترازیان:** *[کینایە]* پەژیوان بوون؛ پاشگەز بوون 🇮🇷 پشیمان شدن

**پلە تسیان:** *[مەجاز]* ١. هەڵە کردن ٢. سست بوونەوە؛ خاو بوونەوە ٣. پەشیمان بوونەوە 🇮🇷 ١. سهو کردن ٢. سست شدن ٣. پشیمان شدن

**پلەبەپلە** / p(i)lebep(i)le/: ☜ **پلیکانی**

**پلـــەپرووزێ** / p(i)lep(i)řûzê/: نـــاو. *[پـــلار]* پەلەپـــرووزەیی؛ پەلەپـــرووزکێ؛ پلەپـــەرتکێ؛ هەڵەداوی؛ هەڵپە؛ بەلەزی؛ لەز و پەلـەی زۆر لـە ترس و تەنگەتاوی ‹وە پلەپرووزێ کێ هاتە لامـان/ لـە مـردن خەلسـت لـە سـای پـەنامان «هـەژار، *بـۆ کوردستان*»› 🇮🇷 شتابزدگی

**پلەپەرتکێ** / p(i)lepertkê/: ☜ **پلەپرووزێ**

**پلەپـەیژە** / p(i)lepeyje/: نـاو. حـەوق؛ پلـەی نەردیوان 🇮🇷 پلەی نردبام

**پلەت** / p(i)let/: ☜ **زینك**

**پلەزیقان** / p(i)lezîqan/: ناو. کاری چەقەنە لێدان و سەما کردن 🇮🇷 پایکوبی و بشکن زدن

**پلەسۆ** / p(i)leso/: ناو. گوڵپەڕ؛ سـۆڵان؛ سـوولان؛ گولەسۆ 🇮🇷 گُلپر

**پلەک** / p(i)lek/: نـاو. پلـە؛ دەرەجـە: ١. یەکـەی ئەندازە گرتنی گۆشـە و کـەوانی جـەغزێک ‹بـە لێژایی سێ پلـەک› ٢. یەکـەی ئەنـدازە گـرتنی گـەرمی و سـەردی ‹گـەرمای هـەوا دوو پلـەک دابەزی› 🇮🇷 ١. درجەی هندسی ٢. درجەی دما

**پلەکان** / p(i)lekan/: ☜ **پلیکان ـ١**

**پلەکانە** / p(i)lekane/: ☜ **پلیکان ـ١**

**پلەگۆشت** / p(i)legoşt/: نـاو. چنچـک؛ پارچـە گۆشت 🇮🇷 چنجه گوشت

**پلەمەند** / p(i)lemend/: ناو. ئەفسەر 🇮🇷 افسر

**پلەنـدەر** / p(i)lender/: ئاوەڵـناو. ١. بـێئابـڕوو؛ ڕووسـیا ٢. شـەڕانی؛ بـێفـەڕ 🇮🇷 ١. بی‌آبـرو ٢. ستیزەجو

**پلەوپایە** / p(i)le w paye/: ناو. پایە؛ پێگە؛ پلە 🇮🇷 جایگاه

**پلەوقولـە** / pilewqule/: نـاو. ١. ڕەوتانـە؛ دەنگ‌وفەنگ ‹مـاڵ گۆزانـەوە پلەوقولـەی زۆرە› ٢. قۆنـاغ و ڕەوت ‹پلەوقولـەی جـەواز گـرتن بـۆ دووکانەکەم هەراسانمی کرد› 🇮🇷 ١. دنـگ‌وفنـگ ٢. بوروکراسی

**پلیان** / pilyan/: چاوگ. ١. سوور خواردن ‹کەفتە پلیان وە دەور خوەیا› ٢. کـەفتن؛ کـەوتن ٣. پـل خـواردن ‹بارەکـە داریـاوە و تـا خـوار پلیـا!› 🇮🇷 ١. چرخیدن ٢. افتادن ٣. غلت خوردن

**پلیتەچرا** / p(i)lîteç(i)ra/: نـاو. فلیتـە 🇮🇷 فتیلـەی چراغ

**پلیخـاو** / p(i)lîxaw/: ئاوەڵـناو. پلـچ؛ ڕزاو؛ فلـچ؛ تلیخاو 🇮🇷 لِه

**پلیخاوی** / p(i)lîxawî/: ناو. پلچی؛ پان و فلّچی 🇮🇷 لِه شدگی

**پلیخین** / p(i)lîxîn/: چاوگ. پلۆخین؛ زۆر کـولان 🇮🇷 له شدن

**پلیرسگ** / p(i)lîrsig/: ☜ **پەڕەسێلکە**

**پلیزرک** / p(i)lîzirk/: ☜ **پەڕەسێلکە**

**پلیزرگ** / p(i)lîzirg/: ☜ **پەڕەسێلکە**

**پلیزک** / p(i)lîzik/: ☜ **پریسك**

**پلیزگردی** / p(i)lîzgirdî/: ☜ **پەڕەسێلکە**

**پلیسر** / p(i)lîsir/: ☜ **پەڕەسێلکە**

**پلیسرک** / p(i)lîsirk/: ☜ **پەڕەسێلکە**

**پلیسری** / p(i)lîsirî/: ☜ **پەڕەسێلکە**

**پلیسە** / p(i)lîse/: ☜ **پەڕەسێلکە**

**پلیش** /p(i)lîş/: ناوەڵناو. فلچ؛ پلیخ ☰ لهیده

**پلیقان** /p(i)lîqan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //پلیقای؛ دەپلیقێی؛ بپلیقێ// فلیقان ☰ له شدن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: پلیقاو/ چاوگی نەرێنی: نەپلیقان

**پلیقاندن** /p(i)lîqandin/: چاوگ. تێپەڕ. //پلیقاندت؛ دەپلیقێنی؛ بپلیقێنە// فلیقاندن ☰ له کردن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: -/ چاوگی نەرێنی: نەپلیقاندن

**پلیقانەوە** /p(i)lîqanewe/: چاوگ. تێنەپەڕ. //پلیقایەوە؛ دەپلیقێیتەوە؛ بپلیقێوە// فلیقان ☰ له شدن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: پلیقاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەپلیقانەوە

**پلیک** /pilîk/: ناو. پیتکە؛ پتە؛ کاری بە سەری قامک لە شتێک دان ☰ تلنگُر

**پلیکان** /p(i)lîkan/: ناو. ١. پلەکان؛ پلەکانە؛ پلیکانە؛ پەلەکانە؛ پێپلیکان؛ پێپلیک؛ پێپلیکە؛ پێپلینک؛ پێپیلکە؛ پلێ؛ پێلک؛ ڕێپێلکە؛ پاچینە؛ پارچینە؛ دەرنجە؛ قادرمە؛ قالدرمە؛ خرک؛ حەوق؛ ڕازونە ٢. کەڵک؛ چەڵک؛ ماسیچنە؛ کەرئاوی؛ کەراڤی؛ سەقاو؛ سەقاقوش؛ قوتان؛ زەرووڵە؛ باڵدارێکی زەلامی ماسیخۆرە، قورتمێکی وەکوو کیسەی لە خوار دندووکەوە هەیە، ماسی و ئاوی تێ دەکا ☰ ١. پلکان ٢. پلیکان؛ مُرغ سقّا

**پلیکانە** /p(i)lîkane/: ☜ **پلیکان ـ١**

**پلیکانی** /p(i)lîkanî/: ناوەڵکار. پلەبەپلە؛ بە شێوەی پلیکان ☰ پلکانی

**پلیکانێ** /p(i)lîkanê/: ناو. هەلووکێن؛ هەلووکان ☰ الکدولک

**پلیکە** /p(i)lîke/: ناو. پلەی نەردیوان؛ پلەی پلیکان ☰ پلّەی نردبان

**پلیمۆت** /p(i)lîmot/: ناو. دیمەن ☰ منظر

**پلێ** /p(i)lê/: ☜ **پلیکان ـ١**

**پڵ** /piɫ/: ناو. ١. پەڵەی پێست ٢. پرد؛ پێڵ ☰ ١. لکەی پوست ٢. پُل

◘ **پڵ هەڵدان**: پەڵە لە پێست پەیدا بوون ‹شێلام زیخ و چەو، درک و پەیکوڵ/ زێری هەر دوو پێم هەڵیداوە پڵ «فولکلۆر»› ☰ لک زدن پوست

**پڵاس** /p(i)ɫas/: ناو. بەڕەی دەزوو؛ ڕایەخی کەمنرخ ☰ پلاس

**پڵاسماسی** /p(i)ɫasmasî/: ناو. جۆرێک ماسی ☰ نوعی ماهی

**پڵاش** /p(i)ɫaş/: ناو. پووش؛ گیای وشکی دەشتی ☰ خس

**پڵاشە** /p(i)ɫaşe/: ناو. پریشە؛ تۆڵاشەی پەڕاوی شتی شکاو یان تەقاو ‹پلاشەی قومپارەیێ دایە نزیک ماڵمانا› ☰ ترکش

**پڵان**[1] /p(i)ɫan/: چاوگ. گلار بوون ☰ غلتیدن

**پڵان**[2]: ناو. ئێسک؛ هەستی؛ ئێسقان ☰ استخوان

**پڵاندن** /p(i)ɫandin/: چاوگ. پلانن؛ پلاننەوە؛ گلاندن؛ گلار کردنەوە ☰ غلتاندن

**پڵانن** /p(i)ɫanin/: ☜ **پڵاندن**

**پڵاننەوە** /p(i)ɫannewe/: ☜ **پڵاندن**

**پڵاو** /p(i)ɫaw/: ناو. پراو؛ پلاڤ؛ پیلاڤ؛ چێشتی برنجی بە پاڵوێنە پاڵێوراو ‹وەک پڵاوی خانەقا ئیسمێکی بێجیسمن برا/ یەک مرووەت، دوو سەخاوەت، سێ وەفای عەهد و قەرار «قانع»› ☰ پلو

**پڵاوپاڵا** /p(i)ɫawpaɫa/: ناو. پلاوپاڵێو؛ پاڵوێنەی برنج؛ سوزمە؛ دەفرێکی قووڵی کون-کونە، برنجی کوڵاوی پێ دەپاڵێون ☰ صافی پلو

**پڵاوپاڵێو** /p(i)ɫawpaɫêw/: ☜ **پڵاوپاڵا**

**پڵاوپەز** /p(i)ɫawpez/: ☜ **پڵاولێن**

**پڵاوخۆر** /p(i)ɫawxor/: ناوەڵناو. *[کنایە]* فێرەپڵاو؛ خۆشخۆراک ‹من پلاوخۆرم بە دۆ تێر نابم/ من

ئەسپ‌سوارم بە کەر فێر نابم «پیرەمێرد»› ⇔ خوش‌خوراک

**پلاوخۆری** / p(i)ławxorî/: ناو. قاپی تایبەتی بۆ پلاو تێ‌کردن ⇔ پلوخوری

**پلاولێن** / p(i)ławlên/: ناو. پلاوپەز؛ دەفرێکی کارەبایی بۆ لێنانی پلاو ⇔ پلوپز

**پلپ** / piłp/: ئاوەڵناو. پلت؛ نەرم و شل؛ نەگرساو ⇔ شُل و نرم

▣ **پلپ بەستن**: مەیین؛ توند بوونی شل ⇔ مُنعقد شدن و بستن

**پلپخان** / piłpixan/: چاوگ. پلپخین؛ کوڵان ⇔ جوشیدن

**پلپخاندن** / piłp(i)xandin/: چاوگ. کوڵاندن ⇔ جوشاندن

**پلپخین** / piłpixîn/: ☜ **پلپخان**

**پلپلە** / piłp(i)łe/: ناو. پپلە ‹مەیلی گوارە و پلپلەی بانی سەری مینا ئەکەم «قانع»› ⇔ از زیورآلات

**پلپلی** / piłp(i)łî/: ئاوەڵناو. چیل ـ چیل؛ پەڵەـپەڵە ⇔ لکه ـ لکه

**پلپیز** / piłpîz/: ناو. لنگ و لەتەر؛ داودەلینگ ⇔ ساق و پوشش ساق

**پلت**[1] / piłt/: ئاوەڵناو. بل؛ نەرم و شل ⇔ شُل

**پلت**[2]: دەنگ. پلتە؛ دەنگی وەک بە زۆر دەرهێنانی چێوپەمەی سەر بوتڵ ⇔ صدای چوب بیرون کشیدن چوب‌پنبه‌ی سر بطری

**پلتک** / piłtik/: ☜ **پلتۆک-١**

**پلتۆخ** / piłtox/: ئاوەڵناو. پولتۆخ: ١. نەبەگە؛ شل‌وشەوێق؛ یەکتر نەگرتوو ٢. پیس؛ ناتەمیس؛ چەپەڵ ⇔ ١. شُل‌وول ٢. کثیف

**پلتۆک** / piłtok/: ناو. ١. پلتۆک؛ پلتک؛ پلتۆکە؛ پلتووکە؛ پیتکە؛ پتیکە؛ تیکە؛ ترنگ؛ ترنگە؛ تیرفڕنگ؛ تیفرنجگ؛ پتە؛ پت؛ پلە؛ پلیک؛ فیتک؛ فیتگ؛ کاری بە قامک لە شتێک دان ٢. پەلەپیتکە؛ پێ؛ ماشە ⇔ ١. تلنگُر ٢. ماشه

**پلتۆکە** / piłtoke/: ☜ **پلتۆک**

**پلتووکە** / piłtûke/: ☜ **پلتۆک**

**پلتە**[1] / piłte/: ناو. تلتە؛ تلف ⇔ دُردی

**پلتە**[2]: ☜ **پلت**[2]

**پلتەپلت** / piłtepiłt/: ناو. بقەبق؛ فلتەفلت ⇔ یاوەگویی

**پلتەخۆری** / piłtexorî/: ناو. فرەخۆری؛ زۆرخۆری ⇔ پُرخوری

**پلچاندن** / piłçandin/: چاوگ. پلچانن؛ تلیخاندن ⇔ له کردن

**پلچاندنەوە** / piłçand(i)newe/: چاوگ. پان کردنەوە ⇔ له کردن

**پلچانن** / piłçanin/: ☜ **پلچاندن**

**پلخان** / piłxan/: چاوگ. پوورخان؛ پلیشان ⇔ له شدن

**پلخاندن** / piłxandin/: چاوگ. پوورخاندن؛ پلیشاندن ⇔ له کردن

**پلخاندنەوە** / piłxand(i)newe/: چاوگ. پلیخاندنەوە؛ پوورخاندنەوە؛ پلیشاندنەوە ⇔ له کردن

**پلخانەوە** / piłxanewe/: چاوگ. پوورخانەوە؛ پلیشانەوە ⇔ له شدن

**پلخە** / piłxe/: ناو. ڕیخی مێروو ⇔ مدفوع حشره

**پلژ** / piłij/: ئاوەڵناو. ١. سیس؛ ژاکاو ٢. کز؛ دژداماو ⇔ ١. پژمُرده ٢. افسرده

**پلژیاگ** / piłijyag/: ئاوەڵناو. سیسیاگ؛ ژاکیاگ ⇔ پژمُرده

**پلژیان** / piłijyan/: چاوگ. ١. سیس بوون؛ ژاکیان ٢. کز بوون؛ دژدامان ⇔ ١. پژمُردن ٢. افسردن

**پلم** / piłm/: ☜ پلم

**پلماندن** / piłmandin/: چاوگ. بۆڵە کردن ⇔

غرولند کردن

**پلمە / pilme/**: دەنگ‌ناو. ١. گریـانی لـەنکاو ٢. پرمە؛ پێکەنینی بە دەنگ ١. گریەی ناگهانی ٢. قهقهه

**پلمیشنای / pilmîşnay/**: چاوگ. پیشاندن (بە ئاور یان بە هەلم) در مجاورت آتش یا بُخار پُختن

**پلمیشیای / pilmîşyay/**: چاوگ. پیشـان (بـە ئـاور یان بە هەلم) با آتش یا بُخار پُختن

**پلنگ[1] / p(i)ling/**: ناو. پلینگ؛ پەلـەنگ؛ پالـنگ؛ پەلـەنگ؛ کـاوێز؛ درنـدەی پێسـت زەردی خـاڵ ڕەش پلنگ

**پلنگ[2]**: ئاوەڵناو. تێکەڵ ـ پێکەڵ و ئاڵـۆز درهـم برهم

**پلنگیـان / p(i)ling(i)yan/**: چـاوگ. ئاڵـۆزان و تێک‌هاڵان درهم برهم شدن

**پلوپووش / pil û pûş/**: ناو. پل‌وپووش؛ پـرووپووش ‹پل‌وپووشێکی وەک مـن کەوتـە بـەر ئـەو شـەمعی ڕوخسـارە/ حـەقی سـووتانە نابێتـە دەلیلـی لـوتفی پاکینت «حەمدی»› خشکه گیاه

**پلۆخ / p(i)lox/**: ئاوەڵناو. ١. پلیشاو؛ ڕزاو ٢. پیس و چلکن ‹ژینگەمان پیس و پلۆخ نەکەین› ١. له و لَورده ٢. کثیف

**پلۆخان / p(i)loxan/**: چاوگ. داقنـان؛ داقـنین له شدن

**پلۆخاو / p(i)loxaw/**: ئاوەڵـناو. داقنـاو؛ داقنیـو لەشده

**پلۆخین / p(i)loxîn/**: ☜ پلیخین

**پلۆزگردی / p(i)losnayere/**: ☜ پەڕەسێلکە

**پلۆسنایەرە / p(i)losnayere/**: ☜ داپلۆساندن

**پلۆسیایەرە / p(i)losyayere/**: ☜ داپلۆسان

**پلۆسین / p(i)losîn/**: ☜ داپلۆسین؛ هەلپلۆسین

**پلۆمای / p(i)lomay/**: چاوگ. پرمە کردن زیـر گریه زدن

**پلووچ / p(i)lûç/**: پێرۆ. ← پیچ‌وپلووچ

**پلیتە / p(i)lîte/**: ناو. فتیلە فتیله

**پلیتەکێش / p(i)lîtekêş/**: نـاو. داروو کـەی چـرای ڕۆن گەرچەک فتیله‌کش

**پلیخ / p(i)lîx/**: ئاوەڵناو. فلچ له

**پلیخان / p(i)lîxan/**: چـاوگ. ١. پـوان؛ داڕزان ٢. فلچەوە بوون ١. پوسیدن ٢. لهیدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: پلـیخاو/ چـاوگی نـەرێنی: نەپلیخان

**پلیخانـــدن / p(i)lîxandin/**: چـــاوگ. تێـــەڕ. //پلیخاندت؛ دەپلیخێنی؛ بپلیخێنە// داپلۆخاندن له کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپلیخاندن

**پلیخاندنەوە / p(i)lîxand(i)newe/**: ☜ پلخاندنەوە

**پلیخانەوە / p(i)lîxanewe/**: ☜ پلیشانەوە

**پلیخاو / p(i)lîxaw/**: ئاوەڵـناو. پلیشاو؛ فلچەوەبـوو لهیده

**پلیخـاوە / p(i)lîxawe/**: ئاوەڵـناو. هەڵـــفلیقاو لەشده

**پلیزر / p(i)lîzir/**: ☜ پەڕەسێلکە

**پلیشـان / p(i)lîşan/**: چـاوگ. تێنەپـەڕ. //پلیشـای؛ دەپلیشێی؛ بپلیشە// پلخان؛ پلیخان لهیدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: پلیشـاو/ چـاوگی نـەرێنی: نەپلیشان

**پلیشـــاندن / p(i)lîşandin/**: چـــاوگ. تێـــەڕ. //پلیشـاندت؛ دەپلیشـێنی؛ بپلیشـێنە// پلـخاندن؛ دەمبەر پێ دان و پان کردنەوە له کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپلیشاندن

**پلیشـــاندنەوە / p(i)lîşand(i)newe/**: چـــاوگ. پلخاندنەوە؛ دەمبەر پێدا پان کردنەوە له کردن

**پلیشـــانەوە / p(i)lîşanewe/**: چـــاوگ. تێنەپـــەڕ. //پلیشایەوە؛ دەپلیشـێیەوە؛ بپلیشـێوە// پلـخانەوە؛ پلیخانەوە؛ فلچ بوونەوە له شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: پلیشاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەپلیشانەوە

**پلیشاو** / p(i)łîşaw/: ئاوەڵناو. پان و فلچبووەوە؛ لە بەر یەک چوو ☰ لە شدە

**پلیشاوە** / p(i)łîşawe/: ئاوەڵناو. پلیشاو ☰ لهیدە

**پلینگ** / p(i)łîng/: ☜ **پلنگ**[1]

**پمپار** / pimpar/: ناو. پەلپینە؛ پرپرە ☰ گیاه خُرفە

**پمپمۆک** / pimpimok/: ناو. پفدانک؛ تیزانگ ☰ بادکُنک

**پن** / pin/: ناو. ١. قرنوو؛ مێروویەکی چکۆڵەی پانکەڵەی سوورە بە پێستی ئاژەڵەوە دەنووسێ ٢. پۆلوو؛ سکڵ؛ پەنگر ٣. پنت؛ خاڵ؛ نوختە؛ پەڵەی چکۆڵە ٤. شەق؛ شەپ ٥. تەرزی باریکی تەڕەکاری ٦. پند؛ قنگ ☰ ١. حشره‌ای کوچک که به پوست دام می‌چسبد ٢. اخگر ٣. نقطه ۴. تیپا ۵. جوانه‌ی جالیزی ۶. پیزی

**پناڵتی** / p(i)naltî/: ناو. ١. سزا؛ تاوان ٢. *[وەرزش]* ئەو تاوانە کە لە سۆنگەی هەڵەیەکەوە، بەری تیمێک دەکەوێ ☰ ١. جریمه ٢. پنالتی

**پنپنۆک** / pinp(i)nok/: ☜ **پتپتۆک**[2]

**پنت** / pint/: ناو. پن؛ پنک؛ خاڵ؛ نوختە؛ پەڵەی گچکە ☰ نقطه

**پنتک** / pintik/: ناو. گزموولە؛ خڕی چکۆلە لە قوڕ ☰ گلوله‌ی کوچک گلی

**پنتی** / pintî/: ئاوەڵناو. ١. پیس؛ گەمار؛ چلکن ٢. تەمەڵ و بێکارە ☰ ١. چرکین ٢. تنبل و لش

**پنج** / pinc/: ناو. پنچ: ١. بنەگیا ‹لەوانەیە ڕۆژی نەورۆز، وەک پنجێک گیا/ لە سەر گردی مەلا مەروان بژیمەوە «پەشێو»› ٢. ڕەگ و ڕیشە ‹ئەو تیشکی خودایە بۆ هەمیشە/ بۆ هەر شتێ بۆتە پنج و ڕیشە «هەژار، *مەم و زین*»› ٣. پینەی قەڵشی دەفری گڵین ☰ ١. بوتە ٢. ریشە ٣. پینه‌ی ظرف سُفالین

⊡ **پنج بەستن**: ڕیشە داکوتان؛ شین بوون و گەشە کردن ☰ ریشە دواندن

**پنج کردن**: ☜ **پنج لێنان**

**پنج لێنان**: پنچ کردن؛ گرتنی درزی دەفری گڵین بە پینەی تایبەتی ☰ مرمت کردن ظرف سُفالین

**پنجاڕ** / pincař/: ناو. ١. بنە گیا؛ پنچکە گیا ٢. گیای خواردنی نەچێنراو ☰ ١. بوتە ٢. گیاه خوراکی چیده نشده

**پنجک** / pincik/: ناو. پنجی چکۆلە؛ دەوەن؛ بنە گیای کورت ☰ بُتّه

**پنجڵ** / pincił/: ئاوەڵناو. دایمە پیس و چەپەڵ ☰ همیشه کثیف

**پنجومۆر**[1] / pinc û mor/: ناو. ١. پەنجەومۆر؛ شوێنی قامک لە ژێر نووسراوەدا ٢. دیلی؛ ئەسیری ‹وەڕەز بووم لەو ژیان و پنجومۆرە/ بە ئازادی بژیم تاوێکی، زۆرە «هێمن»› ☰ ١. اثر انگشت ٢. اسیری

⊡ **پنجومۆر لە خۆ نان**: ١. *[کنایە]* شاتوشووت کردن ٢. لووتبەرزی کردن ☰ ١. لاف زدن ٢. تکبر نشان دادن

**پنجومۆر**[2]: ئاوەڵناو. دیل؛ زیندانی؛ بەندی ‹براکەم لەم ژوورەدا پنجومۆر کراوە› ☰ زندانی

**پنجەدڕوو** / pinced(i)řû/: ناو. بنەدڕک ☰ خاربُن

**پنجەگیا** / pinceg(i)ya/: ناو. تەپکە؛ بنەگیا ☰ بوتە

**پنچ** / pinç/: ☜ **پنج**

**پنچک** / pinçik/: ناو. ١. دەوەن؛ بنە داری پڕژ و چکۆلە ‹سویسکە لە بن پنچک خزا/ چۆلەکە لە جریوە کەوت «هێمن»› ٢. گیایەکە وەک قەیاغ لە زەلکاو و قەراخ ئاو دەڕوێ، میترێک بەرز دەبێتەوە و بۆ باقەبێن کەڵکی لێ وەردەگرن ☰ ١. بوتەی درختی ٢. گیاهی باتلاقی

**پنچەرخێن** / pinçerxên/: ناو. تاولەمە؛ تابلەمە ☰

آتشگردان

**پند** / pind/: ناو. ۱. ئەسپێی مریشک ۲. پنـدرۆ؛ پنـگ؛ کـۆم؛ کـونی پاشـەوەی گیانـدار ۳. ☜ **پندەپیر** 📖 ۱. شـپش مـرغ ۲. سـوراخ مقعـد ۳. ☜ **پندەپیر**

**پنـدر** / pindir/: ئاوەڵـناو. پنگـر: ۱. پنـر؛ کـزر؛ توندەوە بووی شل؛ نیوە وشک ۲. هەڵـقرچاو بـە هۆی ئاو هەڵمژینەوە (پێسـتی پەنجـە) 📖 ۱. نـیم خشـک ۲. چـروک شـدە بـر اثـر جـذب آب (پوسـت انگشتان)

⊡ **پندر بوونەوە**: ۱. وشک و کزر بوونەوە ۲. تـەواو بوونی زگچوون ۳. هەڵقرچانی پێستی پەنجـە بە هەڵمژینی ئاو 📖 ۱. خشک شدن ۲. بند آمدن اسهال ۳. چرووک شدن پوسـت انگشـتان بـر اثـر جذب آب

**پندرپۆزە** / pindirpoze/: ناو. ڕووەکێکە لە قـەراخ جۆگە و ڕووبار دەڕوێ 📖 گیاهی است

**پنـدرحاڵی** / pindirĥałî/: ئاوەڵـناو. [پەلار] ناحـاواو؛ گوێنەبیس 📖 خُشک‌سر

**پندرۆ** / pind(i)ro/: نـاو. پـن؛ پنـد؛ کـۆم؛ کـونی پاشەوەی گیاندار 📖 سوراخ مقعد

**پندری** / pind(i)rî/: ناو. سەقلە؛ گرفت؛ قـەبزی 📖 یبوست

**پندریسک** / pind(i)rîsk/: ناو. باڵـندەیێکی بـۆری چکۆلە و هار و هاج و نەسرەوتە 📖 پرندەای است

**پندریشک** / pind(i)rîşk/: ☜ **پرمێشك**

**پندڕ** / pindiř/: ئاوەڵناو. ڕیشاڵ ـ ڕیشاڵ 📖 پاره ـ پوره

**پندو** / pindû/: ناو. گیایەکە 📖 گیاهی است

**پنـدەپیر** / pindepîr/: نـاو. پنـد؛ جالجاڵـووکە؛ داپیرۆشک 📖 عنکبوت

**پنر** / pinir/: ☜ **پندر-۱**

**پنـری** / pinrî/: نـاو. کـزری؛ نیـوە وشـکی 📖 نـیم خشکی

**پنژ** / pinj/: ناو. ئاروشک؛ پژمە 📖 عطسه

**پنژە** / pinje/: ☜ **پژمە**

**پنژین** / pinjîn/: ☜ **پژمین**

**پنس** / pins/: ناو. کەڕوو؛ کەڕەکیفە 📖 کپک

**پنک** / pink/: ناو. پنت؛ خاڵ 📖 نقطه

**پنکاف** / pinkaf/: ناو. گولاو 📖 گلاب

**پنکاڤ** / pinkav/: ناو. گولاو؛ گولاڤ 📖 گُلاب

**پنک ـ پنک** / pinik pinik/: ئاوەڵـناو. ۱. پەڵـە ـ پەڵە؛ پنۆک ـ پنۆک ۲. کـاژ و واژ؛ خـاڵ ـ خـاڵ (بەفری کوێستان) 📖 ۱. لکه ـ لکه ۲. خال ـ خالی

**پنکۆ** / pinko/: ناو. ژن 📖 زن

**پنگ** / ping/: ناو. ۱. ☜ **پونە** ۲. پەڵە؛ لەکـە 📖 ۱. ☜ **پونە** ۲. لکّه

**پنگاو** / pingaw/: ☜ **پەنگاو**

**پنگر** / pingir/: ناو. ۱. پەرەنگ؛ پۆلوو؛ سکڵ؛ پن؛ پۆل ۲. ☜ **پندر** 📖 ۱. اخگر ۲. ☜ **پندر**

**پنگرکێش** / pingirkêş/: نـاو. ئاسنێکی سەرخواری دەسکدارە، سکڵی پێ ڕادەگوێزن 📖 آتشگیر

**پنگرگر** / pingirgir/: نـاو. پەلکێش؛ مەقاش؛ ماشە 📖 انبُر

**پنگرین** / pingirîn/: چاوگ. تووڕە بوون؛ غەیـدین 📖 عصبانی شدن

**پنگە** / pinge/: ☜ **پونە**

**پنگەسوورە** / pingesûre/: ☜ **سوورەپنگ**

**پنگەڵ** / pingeł/: ناو. پنگەی پیر 📖 پونەی پیر

**پنۆ** / p(i)no/: ☜ **پنۆك**

**پنۆرە** / p(i)nore/: نـاو. داری دوو فلیقانـە بـۆ کـۆ کردنەوەی دڕک و داڵ 📖 چوب دوشاخه برای جمع کردن خس و خاشاک

**پنۆک** / p(i)nok/: پنۆ؛ لەکە؛ خاڵ؛ پەڵەی چووک 📖 لکّه

**پنـۆک ــ پنـۆک** / p(i)nok p(i)nok/: ئاوەڵـناو. خاڵ-خاڵ؛ پەڵە ـپەڵە 📖 لکه ـ لکه

**پنو** / p(i)nû/: ☜ **پینه ـ۱**

**پنه** / p(i)ne/: ناو. پنـێ؛ تەختـە و دەپێکـە ئەنگوتکە هـەویری لـە سـەر پـان دەکەنـەوە ▤ تختەای که خمیر نان را روی آن پهن می کنند

**پنی** / p(i)nî/: ☜ **پینه ـ۱**

**پنیا** / pinya/: ئاوەڵناو. پەنامەکی ▤ نهانی

**پنیسیلین** / p(i)nîsîlîn/: ناو. مـاکی دژە چڵـک (ئانتیبیوتیک) کە لە جۆرێک کارگ دەگـیرێ ▤ پنی‌سیلین

**پنیۆز** / pinyoz/: ↓

⊡ **پنیۆز بون**: چوونی کاتی ▤ رفتن به طور موقت

**پنێ** / p(i)nê/: ☜ **پنه**

**پوار**[1] / p(i)war/: ناو. ۱. گژ و گیای وردیله و نەرم و زۆرتر پەڕیوی خۆرەتاو کە بۆ لەوەڕ زۆر پەسندە ۲. مژەک؛ ئامرازێکی بژیشکی کە تراوی لە لەش پێ هەڵدەکێشن (وەک خوێن و ...) ▤ ۱. ریزەگیاه ۲. پوار

**پوار**[2]: ئاوەڵناو. ۱. پـاقژ؛ پـاک و خـاوێن ۲. ڕزیـو؛ پرتووکاو ▤ ۱. پاک ۲. پوسیده

**پوارتک** / p(i)wartik/: ناو. ڕزوای ناوەڕۆکی دار و درەخت ▤ مغز پوسیدەی درخت

**پواز** / p(i)waz/: ناو. هۆرەی بچووک؛ سنگێکە لە درزی داری قەڵشاوی دەنێن تا یەک نەگرێتـەوە ‹دار پوازی لە خۆی نەبێ، ناقڵەشـێ «مەسـەل»› ▤ بِغاز

**پوازەناو** / p(i)wazenaw/: ناو. دارێکـە وە بـەر بەرداشی دەدەن بۆ بڵند کردنی ▤ بِغاز سنگ آسیا

**پوان**[1] / p(i)wan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //پوای؛ دەپـوێی؛ بپوێ// ڕزین ▤ پوسیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: پواو/ چاوگی نەرێنی: نەپوان

**پوان**[2]: ناو. شیلان؛ جلیق؛ بەری شیلانەکێوی کـە ڕوەکێکی دڕکاوییە ▤ ثمر نسترن کوهی

**پواندن** / p(i)wandin/: چاوگ. ڕزاندن ▤ پوساندن

**پواو** / p(i)waw/: ئاوەڵناو. ڕزیو ‹مس و مەسـینەی لە ژەنگا پواو/ دای بنێ بۆ من لە ساغ و شکاو «قانع»› ▤ پوسیده

**پوای** / p(i)way/: چاوگ. ڕزین ▤ پوسیدن

**پوپی** / pupî/: ☜ **پەپوسڵێمانە**

**پوت** / put/: ناو. ۱. بت؛ بوت؛ خوای دەسـکرد ۲. پورت؛ کولکەی وشتر و بەرخ ▤ ۱. بُـت ۲. کُـرک شتر و برّه

**پوتاسیوم** / putasyum/: ناو. کـالیوم؛ تـوخمی کیمیایی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ۱۹ و کێشی ئەتومی ۳۹,۱۰، کانزایەکی سـپی زێـوی، نـەرم و سووکە و لە سروشتدا بە فراوانی هەیە ▤ پتاسیم

**پوتیتە**[1] / putîte/: ناو. پەتاتـە؛ سـێفەعەرزیلە ▤ سیب‌زمینی

**پوتیتە**[2]: ئاوەڵناو. پۆتە؛ وردیلە ▤ بسیار ریز

**پوتێتە** / putête/: ☜ **پەتاتە**

**پوخت**[1] / puxt/: ناو. کاری لێنانی شێو ▤ پُخت

**پوخت**[2]: ئاوەڵناو. پـاک و تـەکووز ‹کارەکـانی زۆر پوختـن› ▤ مُرتب

⊡ **پوخت کردن**: ڕێکخستن و جێبـەجێ کـردن ▤ ترتیب دادن

**پوخت**[3]: ئاوەڵکار. ۱. بە وردی ‹هەموو بارێکی پوخت لێکداوە› ۲. بە پاکی و تەکووزی ‹پوخت نان دەکا› ▤ ۱و۲. مُرتب

**پوختایی** / puxtayî/: ناو. پوختـە؛ بـژاردەی وتـار ‹پوختایی وتار لە من ببیسی باشە/ تۆزێکی لـە خـۆڵ بەرز ببووی، با بردی «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ▤ چکیدەی سخن

**پوختوپاراو**[1] / puxt û paraw/: ئاوەڵناو. لەبار و بێ کەمایەسی ‹نـە خواردەمـەنیت پوخـتوپـاراوە/ نـە هەرگیز مالت گەسک دراوە «هـەژار، *ئاڵـەکۆک*»› ▤ درست و حسابی

**پوختوپاراو**[2]: ئاوەڵکار. بـە ڕێـکوپێکـی؛ بـەبێ

کەمایەسی ‹ئێمە ئاوا نیشانەکان، پوخت و پاراو، بۆ ئەو کەسانەی تێدەگەن، دەخەینە ڕوو «هەژار، *قورئان*»› ☰ به درستی

**پوختوپەز** / puxt û pez/: ناو. کاری شێو لێنان ☰ پخت‌وپز

**پوختە**[1] / puxte/: ناو. پوختایی؛ هەڵبژاردە؛ بژاردەی قسە ‹دەگەڵ عەبدوڵلا کانی‌مارانی چووینە لای [نووری شاوەیس]. چۆنمان لێ بیست، پوختەکەی دەگێڕمەوە ... «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ چکیده‌ی سُخن

**پوختە**[2]: ئاوەڵناو. لەبار و تەکووز ‹بە ڕاستی ژینی چەمچەمالم هەرچەند درێژ و ناخۆش بوو، بەلام پانیش بوو، گەلێ شتی جوانم تیا نووسی و گەلێ شتی ناتەواوم تیا تەواو کرد. هەروەک گەلێ شتی نووسراویشم تیا پوختە کرد «شێخ موحەممەدی خاڵ»› ☰ مُرتب

**پودوو** / pudû/: ☜ **پدوو**

**پوراشێوکە** / puraşêwke/: ☜ **پوراشێوکە**

**پورت** / purt/: ناو. پەڕ و باڵ ☰ پر و بال

**پورتکاندن** / purt(i)kandin/: چاوگ. پەڕ لێ داڕنین ☰ پر کندن

**پورزان** / purzan/: ناو. پورکنج؛ دڕکێکە وەک وشترخۆرکە ☰ نوعی خار

**پورکنج** / purkinc/: ☜ **پورزان**

**پورگ** / purg/: ناو. ئەو هەودایانەی کرم و جانەوەر لە دەوری خۆیانی دەتەنن ☰ تاری که جانوران به دور خود می‌تنند.

**پوڕ** / puř/: ئاوەڵناو. ۱. زۆر؛ زاف ۲. پڕ؛ سەرڕێژ ‹تا دیدەی مەستت پوڕ سورمەی تووره‌ن/ دیدەی پوڕنەسرم خاو جە لاش دووره‌ن «سەیدی»› ☰ ۱. زیاد ۲. پُر

**پوڕت** / puřt/: ناو. لوا؛ بەرگن؛ تووکی وشتر و بەرخ ☰ کُرک شتر و برّه

**پوڕکری** / puřk(i)rî/: ئاوەڵناو. دامەلاغاس؛ تالان‌کراو ☰ غارت‌شده

**پوژمۆر** / pujmor/: ئاوەڵناو. سیس؛ ژاکاو؛ چرچ‌هەڵگەڕاو ☰ پژمُرده

**پوشت** / puşt/: ناو. ئوبنەیی؛ پیاوی قووندەر ☰ أُبنه

**پوف**[1] / puf/: ناو. ۱. سی؛ جەرگی سپی ۲. فووی بەهێز ☰ ۱. شُش ۲. فوت

**پوف**[2]: دەنگ. پیف؛ وشەی دەربڕینی بێزاری لە بۆنی ناخۆش ☰ پیف

**پوفلک** / pufilk/: ناو. پفدانک؛ تیزانگ؛ پزدانی فوودان ☰ بادکُنک

**پوق** / puq/: ناو. پشت؛ مازی؛ ڕەت ☰ پُشت؛ مقابلِ رو

**پوک** / puk/: ☜ **پووک**[1]_۱

**پوکاوڵە** / pukawłe/: ☜ **پووکاوڵ**

**پول** / pul/: ☜ **پێڵ** _۱

**پولپولۆز** / pulpuloz/: ئاوەڵناو. ئاڵۆزاو؛ شێواو ‹یەکێ ناف گوند دەروێشێک ڤانڤانایە/ سەری پولپولۆز ململانک عەبایە «؟»› ☰ پریشان

**پولیس** / pulîs/: ناو. پۆلیس: ۱. شارەبانی؛ مەزرینگەی بەرپرسی هێمنایەتی ولات ۲. شارەبان؛ هەرکام لە کارگێڕانی شارەبانی ☰ ۱. اداره‌ی پلیس ۲. پلیس

▣ **پولیسی تاوان**: پولیسی نەهێشتنی تاوان ☰ پلیس جرایم

**پولیسی هاتوچۆ**: پولیسی ڕێوبان ☰ پلیس راهنمایی و رانندگی

**پولیسخانە** / pulîsxane/: ناو. نگت ☰ قرارگاه پلیس

**پولیسور** / pulîsur/: ☜ **پەڕەسێلکە**

**پولیسی** / pulîsî/: ئاوەڵناو. ۱. سەبارەت بە پولیس ‹فیلمی پولیسی› ۲. هۆگر و خووگرتوو بە پولیس ‹حکوومەتی پولیسی› ☰ ۱و۲. پلیسی

**پولی‌کۆپی** / pulîkopî/: ناو. ئامرازی کۆپی گرتن ☰ پُلی‌کُپی

**پولیوێر** / pulîwêr/: ناو. جاکەت؛ کراسی چنراوی بەرۆک بەستراو ☰ پُلیور

**پوڵتۆخ** / pułtox/: ☜ **پلتۆخ**

**پوماد** / pumad/: ناو. هەتوان؛ مەڵهەم؛ دەرمانی هەویرئاسای سەر زام ☰ پُماد

**پومپ** / pump/: ☜ **پۆمپ**

**پوند** / pund/: ☜ **پاوەن[1]ـ٥**

**پونژین** / punjîn/: چاوگ. پەنژین؛ پژمین؛ پژمین؛ پشمین ☰ عطسه کردن

**پونس** / punis/: ☜ **پۆنیس**

**پونگ** / pung/: ☜ **پونە**

**پونگاڵ** / pungal/: ناو. ناوەند؛ ناوەڕاست ☰ وسط

**پونگاو** / pungaw/: ☜ **پەنگاو**

**پونگە** / punge/: ☜ **پونە**

**پووێڕ** / puwêř/: ☜ **پوێڕ**

**پوە** / p(i)we/: ناو. بەری قامیش کە وەک لۆکە دەچێ ☰ ثمر نی که شبیه پنبه است

**پوەڵەکارگ** / p(i)wełekar(i)g/: ناو. قارچکی دار؛ قارچکە جنۆکانە؛ قارچەجنانە؛ پیفێ کە وشکەوە دەکرێ بۆ پووشوو ☰ غاریقون؛ قارچ سمی

**پویت** / p(i)wît/: ناو. بەرگن؛ لوا؛ مووی وشتر و بەرخ و کەروێشک ☰ کُرک

**پویڕ** / p(i)wîř/: ☜ **پوێڕ**

**پویست** / p(i)wîst/: ☜ **پێست**

**پویشک** / p(i)wîşk/: ناو. ١. چەڵتووک ٢. بەڵم؛ کای هەرزن و چەڵتووک ☰ ١. شالی ٢. کاه شالی و ارزن

**پویل** / p(i)wîl/: ناو. پووڵ؛ پارە ☰ پول

**پوینە** / p(i)wîne/: ☜ **پونە**

**پۆ[1]** / po/: ناو. ١. هەوالی ڕایەڵ؛ تێوەدانی تەون ٢. ☜ **پەدوو** ٣. لک و پۆپی دار ٤. گوێرووی گەنم ☰ ١. پود ٢. ☜ **پدو** ٣. شاخ و برگ ٤. سیاهک گندم

▣ **پۆ دان**: تاڵی پۆ خستنە چنراوەوە ☰ پود انداختن در بافته

**پۆ دانەوە**: [کینایە] قووڵ بوونەوە؛ نەبڕانەوە ☰ بە درازا کشیدن

**پۆ شکاندن**: [مەجاز] سەرکێشی کردن؛ سەربزێوی کردن ☰ طغیان کردن

**پۆ[2]**: ☜ **پێوە ـ**

• **پۆ[3]**: پاشەوشە. ڕزیو ‹عەنبارەپۆ› ☰ پوسیده

**پۆ[4]**: پێرز. ← **پەڵوپۆ**

**پۆباریک** / pobarîk/: ناو. پۆی وەک دەزوو لە تەوندا ☰ پود باریک در فرشبافی

**پۆپ** / pop/: ☜ **پۆپە**

**پۆپانە** / popane/: ناو. پۆپەی مەل ☰ تاج پرنده

**پۆپچە** / popçe/: ناو. دوگمە؛ کلانە؛ پشکۆژ ☰ دُکمه

**پۆپچەرمگ** / popçermig/: ناو. [کینایە] پۆپچەرموو: ١. پیرێژن ٢. ژنی بەئەزموون و دنیادیتە ☰ ١. پیرزن ٢. زن باتجربه

**پۆپچەرمو** / popçermû/: ☜ **پۆپچەرمگ**

**پۆپرە** / popre/: ☜ **پۆپە**

**پۆپکە** / popke/: ناو. ١. پۆپەی کەڵەشێر ٢. لووتکە؛ دوند ☰ ١. تاج خروس ٢. قلّه

**پۆپڵ** / popił/: ناو. پۆپە ☰ تاج پرنده

**پۆپین** / popin/: ئاوەڵناو. کاکۆڵدار ☰ کاکُلی

**پۆپنە[1]** / popne/: ناو. پۆپە ☰ تاج پرنده

**پۆپنە[2]**: ئاوەڵناو. ١. کاکۆڵدار؛ بە کاکۆڵ ٢. لک و پنجی تێکەڵاوی بلاو (گیا) ☰ ١. کاکُلی ٢. پُر و درهم (گیاه)

**پۆپنەکەڕەشێڵە** / popnekeřeşêłe/: ☜ **پۆپەکەڵەشێرە**

**پۆپنەکی** / popnekî/: ئاوەڵناو. سەربەقیتکە؛

کاکۆڵدار ‹چوڕەپۆپنەکی› 🇮🇷 کاکُلی

**پۆپە** / pope/: ناو. پۆپ؛ پۆپرە؛ پووپە: ۱. پۆپیتە؛ قیتکەی سەری باڵندە ۲. پـۆر؛ کاکۆڵـی سـەری مرۆ ۳. دوند؛ قووچکەی چیا ٤. سەرچڵۆپەی دار؛ بانترین شوێنی دار ‹گوڵی هێنابوو لە پۆپەی چنـار/ لێی دابوو چنار گوڵ بوو بە بەهار «پیرەمێرد»› 🇮🇷 ۱. تاجِ پرنده ۲. کاکُل ۳. قُلّه ۴. نُک درخت

**پۆپـەپان** / popepan/: ناوەڵنـاو. هەزارپۆپـــە؛ هەزارپۆپ؛ هەزارپۆپنـە (کەڵەشـێر) 🇮🇷 تـاج پهـن (خروس)

**پۆپەڕەشـە** / popeřeşe/: نـــاو. پۆپەشــــینە؛ پووپەڕەشە؛ نەخۆشییەکە بە مریشکان وەردەبـێ 🇮🇷 نوعی بیماری ماکیان

**پۆپـەژمین** / popejmîn/: نـــاو. پۆپــەشمین؛ پێخەفێکی زۆر تەنکە لە خوری ئەیکەن 🇮🇷 شـمد پشمی

**پۆپەشمین** / popeşmîn/: ☜ پۆپەژمین

**پۆپەشینە** / popeşîne/: ☜ پۆپەڕەشە

**پۆپەکەڵەشـــێر** / popekełeşêr/: ☜ پۆپەکەڵەشێرە

**پۆپەکەڵەشـــێرە** / popekełeşêre/: نـــــاو. پۆپنەکەڕەشێلە؛ پۆپەکەڵەشێر؛ گوڵـێکی سـوورە لە پۆپە دەکا 🇮🇷 گل تاجخروس

**پۆپەمشار** / popem(i)şar/: ناوەڵناو. هەڕەپۆپە؛ بـە پۆپەی قیت و ددانەدارەوە (کەڵەشێر) 🇮🇷 تاج ارّه‌ای (خروس)

**پۆپیتە** / popîte/: ☜ پۆپە ـ۱

**پۆت**[1] / pot/: ناو. چرچ و لۆچ؛ قرمچـی 🇮🇷 چـین و چروک

**پۆت**[2]: پێرۆ. ← خۆڵوپۆت

**پۆتر** / potir/: ناو. بۆدرە؛ کرێمـی چـەور کـردنی دەست و دەم و چاو 🇮🇷 کِرم دست و صورت

**پـۆتراک** / potrak/: نـاو. پــۆتلاک؛ پۆتــەراک؛ پۆتەلاک؛ پۆتەلاگ؛ سەروگوێلاک؛ دیمەنی سـەر و سەرپۆش 🇮🇷 سر و دستار

**پۆتک** / potik/: ناو. جـلوبـەرگی شـڕ و کـۆن 🇮🇷 لباس مُندرس

**پۆتڵاک** / potłak/: ☜ پۆتراک

**پۆتە** / pote/: ناوەڵناو. پۆتێ؛ زۆر ورد ‹خوەلەپۆتە› 🇮🇷 بسیار ریز

**پۆتەراک** / poterak/: ☜ پۆتراک

**پۆتەکە**[1] / poteke/: ناو. لاتەڕافە 🇮🇷 پهلو

**پۆتەکە**[2]: ناوەڵناو. بێنموود؛ بێفەڕ 🇮🇷 بدترکیب

**پۆتەڵاک** / potełak/: ☜ پۆتراک

**پۆتەڵاگ** / potełag/: ☜ پۆتراک

**پۆتی** / potî/: پێرۆ. ← لۆتی و پۆتی

**پـۆتین** / potîn/: نـاو. پـووتن؛ پـووتین؛ لاپچـین؛ کەوشی لاسک درێژی کەمتر لە چەکمە 🇮🇷 پوتین

**پۆتێ** / potê/: ☜ پۆتە

**پۆخ**[1] / pox/: ناو. ۱. پۆخـە؛ خونچـەی کولـووکی دار ۲. بن و ڕیشەی برین 🇮🇷 ۱. غُنچەی شکوفه ۲. ریشەی زخم

**پۆخ**[2]: ناوەڵناو. زۆر گەیشتووی پلیخاو 🇮🇷 له شده

**پۆخک** / poxik/: ناو. گولینگەی کڵاو 🇮🇷 منگولەی کلاه نمدی

**پۆخل** / poxil/: ☜ پۆخڵ

**پۆخڵ** / poxił/: ناوەڵناو. پۆخـل؛ پۆخڵـە؛ چڵـکن؛ ناتەمیس ‹پیس و پۆخل› 🇮🇷 کثیف

**پۆخڵکار** / poxiłkar/: ناوەڵناو. ناپوختکار؛ گەنەکار 🇮🇷 گندکار

**پۆخڵە**[1] / poxłe/: ناو. بنی برین؛ ڕیشەی بـرین 🇮🇷 ریشەی زخم

**پۆخڵە**[2]: ☜ پۆخڵ

**پۆخڵـەوات** / poxłewat/: نـاو. ۱. کـاری پـیس و بێکەڵک ۲. خرکەوپرکە؛ کەلوپەلی بـێنـرخ 🇮🇷 ۱. کار کثیف و بی‌ارزش ۲. خرت‌وپرت

**پۆخه** / poxe/: ناو. پۆخ؛ خونچەی گلووکی دار غُنچەی شکوفه

**پۆخەکـە** / poxeke/: ئاوەڵـناو. *[پـلار]* قیـزەون؛ ناشیرین ‹تووتـەی پۆخەکـەی پووتـە/ کورتەباڵایـە رووتە «هەژار، *پێنج ئەنگوست*»› بدترکیب

**پۆخەڵـە** / poxełe/: نـاو. دەرەدەوا؛ بـابردۆک؛ پوورئاشۆکە؛ گیایەکە بە لق و پۆی زۆر و ڕیشـەی ناسکەوە، با هەڵـیدەکەنێ و هەڵیدەسووڕێنێ آبلک بادآورد

**پۆخەڵی** / poxełî/: ناو. گەندەڵی؛ فەت فساد

**پۆخین** / poxîn/: ناو. ١. قاوتی گەنم ٢. چێشتی بۆدراو ٣. جێژنێکی ئێزدییانە ١. قاوت گندم ٢. آش قاوت ٣. از اعیاد ایزدی‌ها

**پۆر** / por/: ئاوەڵناو. ١. شـپرز و شـێواو (مـوو) ٢. دۆخی گەرمای زۆر کە بای هەر نایە ١. ژولیـده ٢. حالت گرمای زیاد و هوای ساکن

⊡ **پۆڕ کران**: سـەر و قـژ شـێوانەوە لـە شـیوەن و تازیەدا ‹هەرچی ژن و کیـژە پـۆڕ کـراوە/ ڕوویـان دەڕنی بە دەم سەماوە «هـەژار، *مـەم و زیـن*»› ژولیده شدن موها در عزاداری

**پۆرت** / port/: ناو. ١. پرتـک؛ پرتـووک ٢. پۆڕما؛ قژی سـەر ٣. کـاری تـاریف کـردن ٤. دەرگـی گۆڕینەوەی دەیتا لە نێوان دوو کەمپیوتـەر ١. جزء کوچک ٢. موی سر ٣. تمجید ٤. پورت

**پۆرتخ** / portix/: ناو. زووخ؛ چلکی برین چرک زخم

**پۆرتخه** / port(i)xe/: ناو. بنی برین؛ ریشەی کوان ریشەی ناسور

**پۆرتک**[1] / portik/: نـاو. سـەرپۆش؛ مووداپـۆش سرپوش

**پۆرتک**[2]: ئاوەڵناو. ڕزیو؛ پرتووکیاگ پوسیده

**پۆرتکان** / port(i)kan/: چاوگ. تێنەپەر. //پۆرتکـای؛ دەپۆرتکێی؛ بپۆرتکە// ڕزین؛ پوان فرسودن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: پۆرتکـاو/ چـاوگی نـەرێنی: نەپۆرتکان

**پۆرتکـاو** / port(i)kaw/: ئاوەڵـناو. ڕزاو؛ پـواو پوسیده

**پۆرجن** / porcin/: ناو. بێژنگ آلک

**پۆرخز** / porxiz/: ئاوەڵناو. پۆرخس: ١. چەمووش؛ تـۆڕ ٢. خوێـڕی و بـەرەڵا ٣. ناوچاوتـاڵ ٤. تەوەزەل؛ تەمبەل ١. رموک ٢. بیکاره ٣. تُرشـرو ۴. تنبل

**پۆرخس** / porxis/: ☜ **پۆرخز**

**پۆرسان** / porsan/: ناو. کاوێژ نشخوار

**پۆرساندن** / porsandin/: چاوگ. کـاوێژ کـردن؛ کاوینەوە نشخوار کردن

**پۆرسپی** / pors(i)pî/: نـاو. ١. پـۆپچـەرمگ؛ پیرێـژن ٢. ☜ **پێخەسـو** ١. پیـرزن ٢. ☜ **پێخەسو**

**پـۆرگ** / por(i)g/: نـاو. ١. زیپکـەی هەڵـتۆقیوی پڕئاو ٢. پۆڕگ؛ پۆڵکە؛ پینەی دەست ٣. نێرتکـی ناو دومەڵ ٤. کیس؛ پەنامی برین و بـن دیـان ٥. پـەترۆک؛ پەترۆکـە؛ قرتماخـەی بـرین ٦. چەڵتووک؛ تیکولی برنج ٧. ناو گۆڕکی ڕەشماڵ ٨. باری چیغ و چادر ‹پۆرگ لە سـێبەر، شـادەوارم دی «قانع»› ١. تاول ٢. پینـەی دسـت ٣. غـدّەی داخل دُمل ۴. ورم زخم و دنـدان ۵. کبـرەی زخـم ۶. شالی ۷. آتشدان سیاه چادر ۸. کیسه چادر

**پـۆڕ**[1] / poř/: نـاو. ١. مـووی سـەر ٢. ئاڤـدەل؛ ئایکناسە؛ پوور؛ دوراج؛ زێوەکەو؛ باڵـندەیێکە لـە مریشـک زلتـر، نێریـان ڕەشـی خـاڵ‌خاڵـە و مێکانیان قاوەیی ڕێ ـ ڕێ، لاقی سووره و زۆرتـر خۆ حەشار دەدا ١. موی سر ٢. دُرّاج

**پۆڕ**[2]: ئاوەڵـناو. ١. هەراو؛ گوشاد؛ بەرین ٢. ڕێـک و جـۆر. بەرانبـەر: **نـەپـۆڕ** ٣. چڕ؛ چـڕ و پـڕ ١. عریض ٢. مُنظّم ٣. مُتراکم

**پۆڕان / pořan/**: چاوگ. پۆڕیان؛ ڕێکوپێک بوون؛ جۆر بوون ☰ جور در آمدن

**پۆڕانــدن / pořandin/**: چــاوگ. ۱. داچــــنین؛ دامەزرانــدن لــە شــوێنێ ۲. تــێ‌ترنجانــدن؛ تێ‌تەپاندن ☰ ۱. چیدن ۲. چپاندن

**پۆڕگ / pořig/**: ناو. ئاگربـەرەک؛ بلـۆق؛ تۆقلـە ☰ تاول

**پۆڕما / pořma/**: ناو. پۆرت؛ قژی سەر ☰ موی سر

**پۆڕیان / pořyan/**: ☜ **پۆڕان**

**پۆڕیـای / pořyay/**: چـاوگ. لـوان؛ دەس دان ☰ امکان یافتن

**پۆز / poz/**: ناو. ۱. کەپۆ؛ لـووت ۲. دەم و لـەوس ۳. کۆم؛ کونی قنگ ٤. زەنبوورەی ئاش ٥. فیـز؛ دەمار ٦. پواز ☰ ۱. بینی ۲. لـب و لوچـه ۳. پیـزی؛ سوراخ مقعد ۴. سوراخ تنگ ناو آسیا ۵. غـرور و تکبـر ۶. بغاز

**پۆزکە / pozke/**: نـاو. ۱. بابلیسـۆک؛ لووتی ماسـی ۲. خرتوومی فیل ☰ ۱. دماغ ماهی ۲. خرطوم فیل

**پۆزنکـان / pozinkan/**: چـاوگ. پـوان؛ ڕزیـن ☰ فرسودن

**پـۆزە / poze/**: نـاو. دەم و قــەپۆزی حــەیوان ☰ پوزەی حیوان

**پۆزەبـەن / pozeben/**: نـاو. پۆزەبەنــد؛ زاربــێنی بێچووی شیرخۆری ئاژەڵ ☰ پوزەبند

**پۆزەبەند / pozebend/**: ☜ **پۆزەبەن**

**پۆزەتیف / pozetîv/**: ئاوەڵناو. ئـەرێنی؛ موسـبەت ☰ مُثبت

**پۆزەخوگە / pozexûge/**: نـاو. بەرێکی داری مازوو ☰ نوعی ثمر مازوج

**پۆزەوان / pozewan/**: ☜ **پوزەوانە۔۱**

**پۆزەوانە / pozewane/**: ☜ **پوزەوانە۔۱**

**پـۆژمین / pojmîn/**: نـاو. کـاپۆڵ؛ کـاژە؛ ئێسـکی کەللەسەر ☰ جُمجُمه

**پۆژن / pojin/**: ناو. خەم؛ خەفەت ☰ غُصه

**پۆژنای / pojnay/**: چـاوگ. داپۆشین؛ پۆشاندن ☰ پوشاندن

**پۆژوان / pojwan/**: ☜ **پەشیمان**

**پۆژیـای / pojyay/**: چـاوگ. پۆشــران؛ پۆشــیان؛ داپۆشیان ☰ پوشیده شدن

**پـۆس[۱] / pos/**: نـاو. ۱. پــووس؛ پــێس؛ پێســت ‹عەکس تەجەللای مەشـعەلەی ڕووی دۆس/ شـەوق مەدۆ چوون شەم نە فـانۆس پـۆس «مەولـەوی»› ۲. جێگەی پاسەوانان ۳. تەتەر؛ جێگەی ئاڵوگـۆڕی نامـە ٤. کەوڵــی تیســکن ☰ ۱. پوســت ۲. پُست نگهبانی ۳. پُستخانه ۴. پوستین

⊡ **پۆس کەندن** کـەوڵ کـردن؛ پۆسـت کـردن ☰ پوست کندن

**پۆس گرتنـەوە** پێست کەندن؛ پۆسـت کەنـدن/ کەنن؛ پۆست گرتنەوە: ۱. کەوڵ کردن؛ پێست لـێ کردنـەوە ۲. *(مەجاز)* سـزای سـەخت دان؛ ئەشکەنجە دان ☰ ۱. پوسـت کنـدن ۲. شـکنجه کردن

**پۆس[۲]**: ئاوەڵناو. ڕزیو؛ دارزیاگ ☰ پوسیده

**پۆســان / posan/**: چــاوگ. ۱. ☜ **پۆســـین** ۲. شڵەژان ☰ ۱. ☜ **پۆسین** ۲. آشفتن

**پۆسـاندن / posandin/**: چاوگ. ڕزانـدن؛ پوانـدن؛ پرتووکاندن ☰ پوسانیدن

**پۆس‌پـەنێر / pospenêr/**: نـاو. خیگــە؛ خییــە ☰ خیک

**پۆست / post/**: ناو. ۱. پێست؛ پێس؛ دەرەکی‌ترین بەشی جەستەی مـرۆڤ و گیانـداران ۲. تـوێکڵ؛ تۆکڵ؛ دەرەکـی‌تـرین بەشـی ڕوەک ۳. پۆسـتە؛ پۆسە؛ کاری ناردنی نامە و بەستە لە شـوێنێکەوە بۆ شوێنێکی‌تر ٤. پۆستخانە؛ دەزگـای جێبـەجێ کردنی ئەو کارە ٥. بنکەی پاسەوانان ☰ ۱. پوست ۲. پوسته ۳. پُست ۴. پُستخانه ۵. پُست نگهبانی

◘ **پۆست کردن**: خستنه پۆست؛ بـه پۆسـت هەناردن؛ نامە یان شتی تر بـه پۆسـتخانە دان بۆ گەیاندن ⇐ پُست کردن

**پۆست کەندن/ کەنن**: ☜ **پۆس گرتنەوە**

**پۆست گرتنەوە**: ☜ **پۆس گرتنەوە**

**پۆستاڵ** / postał/: ناو. ۱. پۆس؛ پۆست؛ پێست ۲. پووتین ⇐ ۱. پوست ۲. پوتین

**پۆستچی** / postçî/: نـاو. پۆسـتەچی؛ نامەگـەیێن؛ نامەڕەسان؛ چەپەر؛ کەسی نامەبەر ⇐ نامەرسان

**پۆستخانە** / postxane/: ناو. پۆسـت؛ پۆسـتەخانە؛ پۆسەخانە؛ تەتەر؛ پۆسـتە؛ پـۆس؛ دەزگـای نامـە گوێزانەوە ⇐ پُستخانە

**پۆستگاڵ** / postgał/: نـاو. بن دووگی مـەڕ ⇐ زیـر دُنبەی گوسفند

**پۆسـتمودێرنیزم** / postmudêrnîzm/: نـاو. پاش‌نوێخوازی؛ ڕێبازێک لە وێژە، هونەر، نژیاری و هزروانیدا کە کۆتاییەکانی چـەرخی بیسـتەم، لـە دژی نوێخوازی سەری هەڵدا ⇐ پسامُدرنیسم

**پۆستە** / poste/: ☜ **پۆستخانە**

**پۆستەچی** / posteçî/: ناو. ۱. چەپـەر؛ نامەبـەر ۲. *[مەجاز]* پەیامهێن ‹قسەی چـاک زەحمـەت ئەگاتـە جێی خۆی/ واتەی بەد زۆر کەس پۆسـتەچییە بـۆی! «پیرەمێرد»› ⇐ ۱. نامەرسان ۲. پیامرسان

**پۆستەخانە** / postexane/: ☜ **پۆستخانە**

**پۆستین** / postîn/: ناو. کەوڵی تیسکن ⇐ پوستین

**پۆسک** / posk/: نـاو. زەنبـوورەی ئـاش؛ کـونی خوارووی دۆلاش ⇐ سوراخ ناو آسیا

**پۆسکەندە** / poskende/: ئاوەڵـناو. پۆسـکەنە: ۱. توێکڵ‌لێ‌فڕێدراو ۲. *[کینایە]* ئاشکرا و بێ‌مەرایی ⇐ ۱. پوست‌کندە ۲. رُک و صریح

**پۆسکەنە** / poskene/: ☜ **پۆسکەندە**

**پۆسە** / pose/: ناو. تێکوڵی ناسک ‹وەک هی هێلکە و ...› ⇐ پوستەی نازک

**پۆسەخانە** / posexane/: ☜ **پۆستخانە**

**پۆسیان** / posyan/: چاوگ. ڕزان؛ ڕزیـن؛ داڕزیـن ⇐ پوسیدن

**پۆسین**[1] / posîn/: چـاوگ. پۆسـان؛ ڕزیـن؛ ڕزان؛ داڕزان ⇐ پوسیدن

**پۆسین**[2]: ناو. کەوڵی تیسکن؛ پۆستین ⇐ پوستین

**پۆسـیندروو** / posînd(i)rû/: نـاو. کەوڵـدروو؛ کەوڵکەر ⇐ پوستین‌دوز

**پۆش**[1] / poş/: ئاوەڵـناو. پۆشـە؛ سـپی گـوێ‌ڕەش (بزن) ⇐ سفید سیاەگوش (بُز)

▪ **پۆش**[2]: پاشەوشـە. ـ پووش: ۱. دەبەرکـەر؛ پۆشـەر ‹ڕەشپۆش؛ خوەشپۆش› ۲. ـداپۆش ‹عەیب‌پـۆش؛ سەرپۆش› ⇐ ۱و۲. ـ پوش

**پۆشاک** / poşak/: ناو. جل‌وبەرگ ⇐ پوشاک

**پۆشـاڵ** / poşał/: نـاو. ڕیشـوو؛ پـرزەی قـەراغی قوماش ⇐ تارهای اطراف پارچه

**پۆشان** / poşan/: چاوگ. تێپەڕ. //پۆشات؛ دەپۆشی؛ بپۆشە// کردنە بەر؛ ل خۆ کرن؛ دە بەر کـردن ⇐ پوشیدن؛ بە تن کردن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: پۆشـراو/ چـاوگی نـەرێنی: نەپۆشان

**پۆشـاندن** / poşandin/: چـاوگ. تێـپەڕ. //پۆشـاندت؛ دەپۆشێنی؛ بپۆشێنە// پۆشانن؛ پێ لە بـەر کـردن؛ پێ پۆشین ⇐ پوشاندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپۆشاندن

**پۆشانن** / poşanin/: ☜ **پۆشاندن**

**پۆشای** / poşay/: چاوگ. پۆشین ‹بە وەڵگ خەزان بپۆشان سـەنگم/ تـا نیشـانە بـۆ جـە زەردی ڕەنگـم «بێسارانی»› ⇐ پوشیدن

**پۆشـتە** / poşte/: ئاوەڵناو. ۱. بـەرگی تـازە و بـاش لەبـەر ‹پۆشـتە و تێروپـڕ و خـۆش‌لـەوەڕە/ برسـی و رووت‌وڕەجالم تا کەی؟ «هێمن»› ۲. *[کینایە]* سـاز و بە کەیف ۳. جل‌وبـەرگ دەبـەر ‹گـەدایی سـەیرە

ئەی یار و ڕەفیقان!/ گەهێ پۆشتە بە پینە و گاهێ عوریان «قانع»). بەرانبەر: ڕووت ☰ ۱. شیک پوش ۲. شاد و سرحال ۳. لباس بر تن

⊡ **پۆشتە کردن**: جل‌وبەرگ دابین کردن و دەبەر کردن ☰ لباس مُهیا کردن و پوشیدن/ پوشاندن

**پۆشتە کردنەوە**: ۱. بەرگی کۆن بە تازە گۆڕینەوە ۲. *[کنایە]* ساز و بێ‌نیاز کردنی کەسێک ☰ ۱. لباس تازە پوشانیدن ۲. کسی را بی‌نیاز ساختن

**پۆشتەوپەرداخ** / poştewperdax/: ئاوەڵناو. ڕێک‌وپێک؛ ساز و تەیار ☰ شیک و مُرتب

**پۆشتەیی** / poşteyî/: ناو. کۆکی؛ تەرپۆشی ☰ خوش‌پوشی

**پۆشران** / poşran/: چاوگ. تێنەپەڕ. //پۆشرای؛ دەپۆشرێی؛ بپۆشرێ// پۆشیان: ۱. دە بەر کران ۲. داپۆشران ☰ ۱و۲. پوشیده شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: پۆشراو/ چاوگی نەرێنی: نەپۆشران

**پۆشمان** / poşman/: ☜ پەژیوانی

**پۆشمانی** / poşmanî/: ☜ پەژیوانی

**پۆشە**[1] / poşe/: ☜ پشیلە

**پۆشە**[2]: ئاوەڵناو. پۆش ‹هەمبوو، نەمبوو، چەند قۆشە، دام بە بزنێکی پۆشە› ☰ سفید سیاه‌گوش (بُز)

**پۆشەر** / poşer/: ناو. داپۆشەر ☰ پوشندە

**پۆشەن** / poşen/: ناو. پۆشاک ☰ پوشاک

**پۆشەنی** / poşenî/: ئاوەڵناو. شیاوی دە بەر کردن ☰ پوشیدنی

**پۆشیاگ** / poşyag/: ئاوەڵناو. نوخوم؛ داپۆشراو ☰ پوشیده

**پۆشیان** / poşyan/: ☜ پۆشران

**پۆشین**[1] / poşîn/: چاوگ. تێپەڕ. //پۆشیت؛ دەپۆشی؛ بپۆشە// ۱. دە بەر کردن ۲. وەشاردن؛ پۆشان ‹ئەم سیارۆزی منە پۆشیویە عەیبی کەسان/ ئاشکارە سەتری ئەحوالی گونەهکارانە شەو «مەحوی»› ☰ ۱. پوشیدن ۲. پنهان کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپۆشین

**پۆشین**[2]: ☜ پوشین[1]ـ۱

**پۆشینپێچ** / poşînpêç/: ناو. خشڵی سەر سەرپێچ ☰ زیور سر

**پۆغە** / poğe/: ناو. پانێری نەخەساو ☰ گوسالەی دو سالەی اختە نشدە

**پۆق**[1] / poq/: ناو. گرژی؛ ناوچاوتاڵی ☰ اَخم

⊡ **پۆق کردن**: ناوچاو دانە یەکا؛ ڕوو گرژ کردن ☰ اَخم کردن

**پۆق**[2]: پێرۆ. ← تەق‌وپۆق

**پۆقژە** / poqje/: ناو. پۆرگ؛ وردە زیپکەی پێست کە ئاوی تێدا بێ ☰ تاول ریز

**پۆقە**[1] / poqe/: دەنگەناو. گرمە؛ دەنگی تەقینەوە ☰ صدای انفجار

**پۆقە**[2]: پێرۆ. ← تەقەوپۆقە

**پۆک** / pok/: دەنگ. وشەی سەیرمان ☰ کلمەی تعجب

**پۆکەر** / poker/: ناو. پوکیر؛ جۆرێ قوماری بە پەڕانە ☰ پوکر

**پۆکێ** / pokê/: ئامراز. پەوچێ؛ بۆیە؛ بەو بۆنەوە ☰ بە این خاطر

**پۆل** / pol/: ناو. ۱. سکڵ؛ پەنگر؛ پەن؛ پۆلوو ۲. دەستە؛ تیپ؛ کۆمەڵێ لە چەند شتی هاوجۆر بەتایبەت کۆمەڵێک لە چەند گیاندار ‹حەیفە وا پۆل بە پۆل لە بێگارا/ زەرد و ژاکاو و زیز و بێ‌ڕەنگن «قانع»› ۳. کلاس؛ وەتاغی دەرس ٤. سەرپیل؛ شەپیلک؛ ئێسکی پانی شان ☰ ۱. اخگر ۲. دستە؛ گروە ۳. کلاس درس ۴. استخوان کتف

**پۆلان** / polan/: ناو. ڕەشەمە؛ سێهەم مانگی زستان، دوامانگی ساڵ ☰ اسفند

**پۆل ـ پۆل** / pol pol/: ناو. دەسە ـ دەسە ‹چوون ئاهووی خوتەن، ڕەوێڵەی قەتار/ پۆل ـ پۆل نازاران

مەبینان قەتار «سەیدی»» ☰ دستە۔ دستە؛ گروە ۔گروە

**پۆلکە** / polke/: ناو. ١. پـۆرگ؛ پینـەی دەسـت؛ بلۆقی پێست ٢. مەلاشـوو ☰ ١. پینـەی دسـت ٢. ملاج

**پۆلگر** / polgir/: ناو. کەرەخنە؛ مـەقاش؛ ماشـەی ئاگر ☰ آتش کاو

**پۆلگەشێن** / polgeşên/: نـاو. تاولەمـە؛ تابلەمـە؛ تابلمە ☰ آتشگردان

**پۆلونیـوم** / polunyum/: نـاو. تـوخمی کیمیـایی ڕادیۆئەکتیڤی وەک‌کانزا، بە ژمارەی ئەتومی ٨٤ و کێشی ئەتومی ٢١٠ ☰ پلونیوم

**پۆلۆتقـە** / polotqe/: نـاو. مـەرایی؛ خولـتە؛ کلکەسووتێ ☰ ریاکاری

**پۆلو** / polû/: ناو. پۆل؛ پۆلی؛ سکل ☰ اخگر

**پۆلوگر** / polûgir/: ناو. ماشـە؛ پـەنگر؛ مقـاش ☰ ماشە؛ انبُر زغالگیر

**پۆلی** / polî/: ☜ **پۆلو**

**پۆلیس** / polîs/: ☜ **پولیس**

**پـۆلین** / polîn/: چاوگ. پـۆل ـ پـۆل کـردن ☰ کُپە ـ کُپە کردن

**پۆلێن** / polên/: ناو. دەستەبەندی؛ گرۆبەندی: ١. کـار و ڕەوتی دابەشـین بـە دەسـتە و گـرۆ ٢. چۆنیەتی دابەش بوون یا دابەش کردنی دەستە و شێوازی دانانیان ☰ ١و٢. گروەبندی

**پۆلا** / poła/: نـاو. پۆلاد؛ پەرەندا؛ چلـک؛ ئالیـاژی ڕەق و چەکشخۆری ئاسن بـە ڕێژەیـەکی کـەمی کەربونەوە کە ماکێکی زۆر بەکارە ☰ فولاد

**پۆلاخـۆر** / połaxor/: ئاوەلـناو. *[مـەجاز]* ئـازا و گوێنەدەر بە خەتەر ☰ نترس

**پۆلاد** / poład/: ☜ **پۆلا**

**پۆلانیا** / połan(i)ya/: نـاو. کاری وەسەر خستنی گاسن ☰ کار وصل کردن نُک گاوآهن

**پۆلایین** / połayîn/: ئاوەلناو. چێبـوو لـە پـۆلا ☰ پولادین

**پۆلکە** / połke/: نـاو. ١. گـاگووز؛ ولێـرە؛ خلێـرە؛ شۆقل؛ گیایەکی کەلووداری بەرەکـەی لـە ماشـی درشت دەچێ ٢. پاقلەکێوی ☰ ١. خُلّر ٢. بـاقلای کوهی

▣ **پۆلکە حۆلە**: پۆلکە گایانـە؛ جۆرێـک پۆلـکەی خۆڕسکە گەلای بنەوش دەر دەکا، دانەکەی لە ئاووخوێدا دەکولـێنن و دەیخـۆن، کەسـێ بـە کالی بیخوا گێژی دەکا ☰ نوعی خُلّر

**پۆلکە خاتوونە**: جۆرێک پۆلکەی خۆڕسـکە، بـە کالی دەخورێ ☰ نوعی خُلّر

**پۆلکە ڕەشە**: ☜ **پۆلکە مارانە**

**پۆلکە گایانە**: ☜ **پۆلکە حۆلە**

**پۆلکە مارانە**: پۆلـکە ڕەشـە؛ جـۆرێ پۆلـکەی خۆڕسکە، ناخورێ ☰ نوعی خُلّر

**پۆلکەمارانە** / połkemarane/: ☜ **پاقلەمارانە**

**پۆمبیدانک** / pombîdanik/: ☜ **پەمۆدانە**

**پۆمپ** / pomp/: ناو. پومپ؛ ئامرازی هەلکێشـان و گواستنەوەی گاز و تراو ☰ پُمپ

**پۆمپـاژ** / pompaj/: نـاو. کـار و ڕەوتی ڕاگـوێزانی تراو بە پۆمپ ☰ پُمپاژ

**پۆن** / pon/: نـاو. سووڕی مانگانە؛ حـەیز؛ خـوێنی ژن ☰ قاعدگی

**پـۆنجین** / poncîn/: چـاوگ. ڕامـان؛ تێفکـرین ☰ اندیشیدن

**پـۆنژین** / ponjîn/: چـاوگ. ١. خــەو بردنــەوە؛ وێژنگ دان ٢. ڕامـان و دە بـیرەوە چـوون ☰ ١. پینکی رفتن ٢. درماندن و از یاد رفتن

**پۆنس** / ponis/: ☜ **پۆنیس**

**پۆنگ** / pong/: ☜ **پەنگـە**

**پۆنگاو** / pongaw/: ☜ **پەنگاو**

**پۆنی** / ponî/: ئاوەلناو. لە پۆندا بوو ☰ قاعدە؛ رِگل

**پـۆنیس** / ponîs/: نـاو. پـۆنس؛ پـونس؛ بزمـار

مەبینان قەتار «سەیدی»} ☰ دستە۔ دستە؛ گروە ۔گروە

**پۆلکە / polke/**: ناو. ١. پـۆرگ؛ پینـەی دەسـت؛ بلۆقی پێست ٢. مەلاشـوو ☰ ١. پینـەی دسـت ٢. ملاج

**پۆلگر / polgir/**: ناو. کەرەخنە؛ مـەقاش؛ ماشـەی ئاگر ☰ آتش کاو

**پۆلگەشێن / polgeşên/**: نـاو. تاولەمـە؛ تابلەمـە؛ تابلمە ☰ آتشگردان

**پۆلونیـوم / polunyum/**: نـاو. تـوخمی کیمیـایی ڕادیۆئەکتیڤی وەک‌کانزا، بە ژمارەی ئەتومی ٨٤ و کێشی ئەتومی ٢١٠ ☰ پلونیوم

**پۆلۆتقـە / polotqe/**: نـاو. مــەرایی؛ خولـــتە؛ کلکەسووتێ ☰ ریاکاری

**پۆلو / polû/**: ناو. پۆل؛ پۆلی؛ سکل ☰ اخگر

**پۆلوگر / polûgir/**: ناو. ماشـە؛ پـەنگر؛ مقـاش ☰ ماشە؛ انبُر زغالگیر

**پۆلی / polî/**: ☜ **پۆلو**

**پۆلیس / polîs/**: ☜ **پولیس**

**پۆلین / polîn/**: چاوگ. پـۆل ـ پـۆل کـردن ☰ کُپە ـ کُپە کردن

**پۆلێن / polên/**: ناو. دەستەبەندی؛ گرۆبەندی: ١. کـار و ڕەوتی دابەشـین بـە دەسـتە و گـرۆ ٢. چۆنیەتی دابەش بوون یا دابەش کردنی دەستە و شێوازی دانانیان ☰ ١و٢. گروەبندی

**پۆلا / poła/**: نـاو. پۆلاد؛ پەرەندا؛ چلـک؛ ئالیـاژی ڕەق و چەکشخۆری ئاسن بـە ڕێژەیـەکی کـەمی کەربونەوە کە ماکێکی زۆر بەکارە ☰ فولاد

**پۆلاخـۆر / połaxor/**: ناوەلـناو. *[مـەجاز]* ئـــازا و گوێنەدەر بە خەتەر ☰ نترس

**پۆلاد / poład/**: ☜ **پۆلا**

**پۆلانیا / połan(i)ya/**: نـاو. کاری وەسەر خستنی گاسن ☰ کار وصل کردن نُک گاوآهن

**پۆلایین / połayîn/**: ناوەلـناو. چێبـوو لـە پـۆلا ☰ پولادین

**پۆڵکە / połke/**: نـاو. ١. گـاگووز؛ ولێـرە؛ خلێـرە؛ شۆقل؛ گیایەکی کەلووداره بەرەکـەی لـە ماشـی درشت دەچێ ٢. پاقلەکێوی ☰ ١. خُلَر ٢. بـاقلای کوهی

▣ **پۆڵکە حۆلە**: پۆڵکە گایانـە؛ جۆرێـک پۆڵـکەی خۆڕسکە گەلای بنەوش دەر دەکا، دانەکەی لە ئاووخوێدا دەکولـێنن و دەیخـۆن، کەسـێ بـە کالی بیخوا گێژی دەکا ☰ نوعی خُلَر

**پۆڵکە خاتونە**: جۆرێک پۆڵکەی خۆڕسـکە، بـە کالی دەخورێ ☰ نوعی خُلَر

**پۆڵکە ڕەشە**: ☜ **پۆڵکە مارانە**

**پۆڵکە گایانە**: ☜ **پۆڵکە حۆلە**

**پۆڵکە مارانە**: پۆڵـکە ڕەشـە؛ جـۆرێ پۆڵـکەی خۆڕسکە، ناخورێ ☰ نوعی خُلَر

**پۆڵکەمارانە / połkemarane/**: ☜ **پاقلەمارانە**

**پۆمبیدانک / pombîdanik/**: ☜ **پەمۆدانە**

**پۆمپ / pomp/**: ناو. پومپ؛ ئامرازی هەڵکێشـان و گواستنەوەی گاز و تراو ☰ پُمپ

**پۆمپـاژ / pompaj/**: نـاو. کـار و ڕەوتی ڕاگـوێزانی تراو بە پۆمپ ☰ پُمپاژ

**پۆن / pon/**: نـاو. سووری مانگانە؛ حـەیز؛ خـوێنی ژن ☰ قاعدگی

**پـۆنجین / poncîn/**: چـاوگ. ڕامـان؛ تێفکـرین ☰ اندیشیدن

**پـۆنژین / ponjîn/**: چـاوگ. ١. خـــەو بردنـــەوە؛ وێژنگ دان ٢. ڕامـان و دە بـیرەوە چـوون ☰ ١. پینکی رفتن ٢. درماندن و از یاد رفتن

**پۆنس / ponis/**: ☜ **پۆنیس**

**پۆنگ / pong/**: ☜ **پەنگـە**

**پۆنگاو / pongaw/**: ☜ **پەنگاو**

**پۆنی / ponî/**: ناوەلناو. لە پۆندا بوو ☰ قاعدە؛ رِگل

**پـۆنیس / ponîs/**: نـاو. پـــۆنس؛ پـــونس؛ بزمـــار

ئاسایەکی کورت و باریک و سەرپان 🇮🇷 پونس

**پۆیاگ** / poyag/: ئاوەڵناو. ڕزیو؛ داڕزیو؛ پرتووکاو 🇮🇷 پوده

**پۆیان** / poyan/: چاوگ. ڕزان؛ داڕزان؛ پرتووکیان 🇮🇷 پودن

**پۆیلانە** / poylane/: ☜ **پۆیلە**

**پۆیلە** / poyle/: ناو. پۆیلانە: ١. دیاری بۆ تازەزاوا و تازەبووک ٢. لیزگە مووروو کە بۆ خشڵ لە سەری دەدەن ‹بە لەنجەولاری نیمچە غەزالان/ بە هاڕەی پۆیلەی نازک نەوهالان «قانع»› 🇮🇷 ١. کادو برای عروس و داماد ٢. رشته مُهرەهای زینتی سر

**پۆیلەدار** / poyledar/: ئاوەڵناو. ڕازاوە بە پۆیلە ‹کە دەچنە بەر بناران/ بە چۆپی پۆیلەداران/ عومر دەگێڕنە دواوە «پیرەمێرد»› 🇮🇷 آراستە با رشتە مُهرەهای زینتی

**پو** / pû/: ☜ **پوك**[1]–١

**پوپڕ** / pûpiř/: ناو. تاڵان؛ پووڕ؛ پویر 🇮🇷 غارت

**پوپە** / pûpe/: ☜ **پۆپە**

**پوپەڕەشە** / pûpeřeşe/: ☜ **پۆپەڕەشە**

**پوت**[1] / pût/: ناو. ١. گزرە؛ گیای گیرەکراو ٢. کێشێکە بەرانبەر بە ١٦ کیلۆ ٣. دەفری هەڵگرتنی تراو و شلەمەنی ‹پووتێ نەوت› 🇮🇷 ١. گیاه پرس شده ٢. پوت، برابر ١۶ کیلو ٣. پیت

**پوت**[2]: ئاوەڵناو. ١. کورت و لاواز ٢. والا؛ بەتاڵ؛ ناوخاڵی ‹سەرپووت› 🇮🇷 ١. کوتاه و لاغر ٢. میان تهی

**پوت**[3]: پێرۆ. ← **ڕوت‌وپوت**

**پوتاندنەوە** / pûtand(i)newe/: چاوگ. پووچاندنەوە؛ چرووساندنەوە 🇮🇷 تحلیل بُردن

**پوتانەوە** / pûtanewe/: چاوگ. پووچانەوە؛ چرووسانەوە 🇮🇷 تحلیل رفتن

**پوتک** / pûtik/: ناو. خۆرە؛ گولی؛ ئالکە 🇮🇷 جُذام

**پوتن** / pûtin/: ☜ **پۆتین**

**پوتە** / pûte/: ☜ **پوتەکە**

**پوتەک** / pûtek/: ئاوەڵناو. *[پلار]* ١. زۆرخۆر و چلێس ٢. بێ‌نمووت و کورت و کز 🇮🇷 ١. شکمبارە ٢. لاغر و کوتاه

**پوتەکە** / pûteke/: ئاوەڵناو. *[پلار]* پووتە؛ پووتەڵ؛ بێ‌نمووت؛ بەرچاوتەنگر 🇮🇷 کوتاه و بی‌نمود

**پوتەگا** / pûtega/: ناو. خالیگە؛ کەلەکە؛ لابرک 🇮🇷 تُهیگاه

**پوتەڵ** / pûteł/: ☜ **پوتەکە**

**پوتین** / pûtîn/: ☜ **پۆتین**

**پوچ** / pûç/: ئاوەڵناو. ١. پووچەڵ؛ بێ‌ناوک؛ بێ‌کاکڵ ٢. *[کینایە]* بێ‌مانا و خەیاڵی ٣. *[کینایە]* بەتاڵ؛ هەڵوەشاو ‹شێتا فیکر و تۆ؟ خەیاڵت پووچەن/ خەیاڵ هەر سەفەر کارسازی کۆچەن «سەیدی»› 🇮🇷 ١. میان‌تُهی ٢. بی‌معنی ٣. باطل

**پوچاندنەوە** / pûçand(i)newe/: ☜ **پوتاندنەوە**

**پوچانەوە** / pûçanewe/: ☜ **پوتانەوە**

**پوچاوە** / pûçawe/: ئاوەڵناو. ڤەنشتی 🇮🇷 فروکش کردە

**پوچنایەوە** / pûçnayewe/: چاوگ. پووکاندنەوە 🇮🇷 پوچاندن

**پوچەک** / pûçek/: ☜ **پوچەڵ**

**پوچەڵ** / pûçeł/: ئاوەڵناو. پووچەک: ١. بێ‌نرخ و بێ‌برەو ٢. بێ‌ئاکام ‹تەقالاکەم پووچەڵ بوو› ٣. بێ‌کاکڵ ‹بادامی پووچەڵ› 🇮🇷 ١. بی‌ارزش ٢. بی‌نتیجە ٣. پوچ

**پوچی** / pûçî/: ناو. بەتاڵی 🇮🇷 پوچی

**پوچیایەوە** / pûçyayewe/: چاوگ. پووکانەوە 🇮🇷 پوچیدن

**پود** / pûd/: ئاوەڵناو. کرووز؛ ژەنگ‌لێدراوی زبر و کون‌–کون 🇮🇷 زنگ‌زدەی فرسودە

**پور** / pûr/: ناو. پووریّ؛ پوورکە؛ پوورک؛ میمی؛ میمک؛ میمگ؛ مەتی؛ مەتیە؛ پلک؛ بتی؛

خوارک: ١. میمگە؛ مەت؛ مەتە؛ مەتک؛ ماتک؛ ماتگ؛ تیتک؛ ئامک؛ کچچی؛ کچی؛ پلکە؛ پیلک؛ پلە؛ پل؛ عەتە؛ دەدە؛ دێد؛ ئاییە؛ ئاییا؛ ئایە؛ خوشکی باوک ٢. پایک؛ پای؛ میم؛ خاماجی؛ هالە؛ دێگە؛ خالتێک؛ خۆشکی دایک ☰ ١. عمّە ٢. خالە

**پوورئاشۆکە** / pûr'aşoke/: ☜ **پۆخەڵە**

**پووراشێوکە** / pûraşêwke/: ناو. پوراشێوکە؛ پوورایشۆکە؛ خلێرە؛ داپیرۆشک؛ داپیرۆکە؛ پیرێژنۆکە؛ پیرایشۆکە؛ پیرۆشک؛ مامەخۆلینە؛ شەگورگانە؛ تیتگەشوانە؛ چوس گورگ؛ کەرەجنە؛ هەرلە؛ گەنەکەولە؛ کەرەکەولە؛ خڕخاکی؛ مەلخاکی ☰ خرخاکی

**پوورایشۆکە** / pûrayşoke/: ☜ **پووراشێوکە**

**پوورپنۆک** / pûrpinok/: ناو. [مەجاز] پیرێژنی دلناسک و گرینۆک ‹پوورپنۆک لە بیانوو بەندە بۆ گریان› ☰ پیرزن دل‌نازک

**پوورت** / pûrt/: ناو. تووکی وردی مەل ☰ کُرک پرندە

**پوورخان** / pûrxan/: چاوگ. تولخان؛ پلخان ☰ لە شدن

**پوورخاندن** / pûrxandin/: چاوگ. تولخاندن؛ پلخاندن ☰ لە کردن

**پوورخاندنەوە** / pûrxand(i)newe/: چاوگ. تولخاندنەوە ☰ لە کردن

**پوورخانەوە** / pûrxanewe/: چاوگ. تولخانەوە؛ پلخانەوە ☰ لە شدن

**پووردیشێ** / pûrdîşê/: ناو. پنجە درکێکە ☰ خاربنی است

**پوورزا** / pûrza/: ناو. فرزەندی پوور ☰ خالەزادە/ عمەزادە

**پوورزازا** / pûrzaza/: ناو. نەوەی پوور ☰ نوەی عمّە/خالە

**پوورک** / pûr(i)k/: ☜ **پوور**

**پوورکە** / pûrke/: ☜ **پوور**

**پوورە** / pûre/: ناو. شلخەمێش‌هەنگوین ☰ نسل تازەی زنبور عسل

▣ **پوورە دان**: شلخەدانی هەنگ ☰ بیرون آمدن نسل تازەی زنبور از کندو

**پوورەهەنگ** / pûreheng/: ناو. پێتاک؛ شهـ ☰ انبوە زنبور عسل

**پووریّ** / pûrê/: ☜ **پوور**

**پووڕ** / pûř/: ناو. تالان ☰ غارت

**پووڕاندن** / pûřandin/: چاوگ. بە زۆر ئاخنین ☰ چپاندن

**پووڕکوڕکراو** / pûřkuřk(i)raw/: ئاوەڵناو. گێسووبڕی؛ تایبەتمەندی ژنی خراپ ☰ گیسوبُریدە

**پووڕکەر** / pûřker/: ناو. نەژدڤان؛ تالانچی ☰ چپاولگر؛ غارتگر

**پووز** / pûz/: ناو. بەلەک؛ لەتەر؛ نێوان قولەقاپە و ئەژنۆ ‹پووزی خڕ و مڕ، کەوشی سلێمانی/ دەرپێی دەسەسڕ نیشتووە لە بانی «فولکلۆر»› ☰ ساق

**پووزبەران** / pûzberan/: ئاوەڵناو. قەپۆزبەران؛ ئێسکی سەر لووت زەق ☰ دماغ عقابی

**پووزپووزێن** / pûzpûzên/: ناو. یارییەکە بە هەڵمات دەکرێ، قوولکێک هەڵدەکەنن و هەڵماتەکە بە پل دەهاون هەر کەس بیخاتە قوولکەوە، بەرەندەیە ☰ نوعی تیلەبازی

**پووزپێچ** / pûzpêç/: ناو. پاتاوە؛ پێتاوە؛ بەلەک‌پێچ ☰ پاتابە

**پووزلەخ** / pûzlex/: ☜ **پووزەوانە-١**

**پووزە** / pûze/: ناو. جێ‌لەوەڕ؛ چایەر ☰ چراگاە

**پووزەخووگە** / pûzexûge/: ناو. بەرێکی دارمازوو ☰ از ثمرهای مازو

**پووزەوان** / pûzewan/: ☜ **پووزەوانە-١**

**پوزەوانـە** / pûzewane/: نـاو. ١. پـــووزەوان؛ پۆزەوان؛ پۆزەوانە؛ پووزلەخ؛ پزلووخ؛ بەلەک پـێچ؛ ساقبەند ٢. ئاڵقەی لووتی حەیوان ☰ ١. ساق‌پیچ ٢. حلقەی بینی حیوان

**پوس** / pûs/: ناو. ١. پێست ٢. ڕەبەت؛ بۆسـە ☰ ١. پوست ٢. کمین شکارچی

**پـوش**[١] / pûş/: ناو. چیلکـە؛ پـڕوپووش؛ پـرپیش؛ خاشـاڵ؛ خـەش‌وخـاڵ؛ پـووش و پـەلاش؛ گەرش‌وگێل ‹دل لە غەمدا وشکە هەر وەک پووشی وشکی شارەزوور/ تۆ لە من تەکلیفی شیعری شـۆخ و تازە و تەڕ دەکەی؟! «ناری»› ☰ خاشاک

◙ **پوشی بەر ڕۆژ:**[کینایە] مرۆی سووک و بـێ‌نـرخ ☰ آدم سبک و بی‌ارزش

◙ **پوش دانە دەست:**[کینایە] زەرەر پێ‌گەیانـدن ☰ زیان رساندن

**پوش لە کا بژاردن:**[مەجاز] چاک لە خراپ جیـا کردنەوە ☰ خوب را از بد جدا کردن

**دەس لـە پـوش مانـەوە:**[کینایـە] هـیچ دەسـت نەگرتن ☰ فایدەای نبردن

**دەم لە پوش بـون:** هیچ پێ نەگەیشتن ☰ دست خالی ماندن

• **پوش**[٢]: پاشەوشـە. ـ پۆش: ١. دەبەرکـەر؛ پۆشـەر ‹خوەشپووش؛ سیاپووش› ٢. ـداپـۆش ‹نـاو پلـەی ڕاڕەو ماڵ وافوور خان/ سـێ‌پـووش فـەرش کریـاو وە قاڵی کاشان «شامی»› ☰ ١و٢. ـ پوش

**پوشانە** / pûşane/: ناو. بـاجی لـەوەڕ؛ سـەرانەی ئاژەڵ بۆ ئاغا ‹تەنیا سێ سەر بزنم هەیە، دەڵێن بێنە پووشانە!› ☰ حق المرتع

**پوش‌بەقنگە** / pûşbeqinge/: ☜ **پوش‌بەقونە**

**پوش‌بەقونە** / pûşbeqûne/: ناو. پـووش‌بەقنگـە؛ زەلەقوون؛ دومدیکە ☰ سَنجاقک

**پوشپار** / pûşpar/: ناو. وشکە گیا ☰ خشکە گیاە

**پوشپەڕ** / pûşpeř/: ناو. ١. چوارەم مـانگی سـاڵـی کوردی؛ یەکەمین مانگی هاوین کـە ٣١ ڕۆژە ٢. دوای جەنگەی گیا دروون ☰ ١. تیرمـاە ٢. پـس از موسم درو گیاە

**پوشـکە** / pûşke/: نـاو. چیلکـــە؛ داروو‌کـــەی سووتەنی ☰ هیمە؛ تکّە چوب

◙ **پوشکە پسانێ:**[مەجاز] نێوان تێکچـوون؛ تـۆران ☰ قهر کردن

**پوشکەبەفو** / pûşkebefû/: ناو. کایەیەکی لاوانی گوندنشینە، پووشکە بە تێلـێکەوە هەڵدەواسـن و گڕی دەدەن، هەر کەس بـە فـوو بیکوژێنێتـەوە، بەرەندەیە ☰ از بازی‌های جوانان روستایی

**پوشل** / pûşil/: ناو. تووک؛ دوعای خراپ ☰ نفرین

**پوشلە** / pûşle/: نـاو. پووشەڵە؛ چیلکەی سەر بـە لۆکە، بۆ عیمالەی مناڵ بە کار دێ ☰ شیاف چوبی بچە

**پـوش‌وپار** / pûş û par/: نـاو. گژوگیـا؛ پووش‌وپلاش؛ ڕوەک ☰ نباتات علفی

**پـوش‌وپاڵ** / pûş û pał/: ناو. شـەخەڵمەخـەڵ؛ خشت‌وخـاڵ؛ هـەژک‌وپـژاڵ؛ شـتی بـێ‌بایـەخ و دەسگر ☰ آت و آشغال

**پوش‌وپلاش** / pûş û p(i)łaş/: ☜ **پوش‌وپەلاش**

**پوش‌وپەلاش** / pûş û pełaş/: ناو. پووش‌وپـلاش؛ گیای بابردەڵەی وشـک ‹نـازانی ئەگـەر چۆنـە بـە دەس دەردەوە حالی/ وەک پووش‌وپەلاشێکە بە دەم باوە دلی من «بێخود»› ☰ خس و خاشاک

**پوشـو** / pûşû/: نـاو. پووشـی؛ پیشـۆ؛ پیفـک؛ هەرچی زوو ئاگر بگرێ ☰ آتشگیرە

**پوشەک** / pûşek/: ناو. پیژۆکی؛ پیژۆک ☰ زعفران وحشی

**پوشەلان** / pûşełan/: ناو. جێگای پڕ لە وشکەگیـا ☰ جای پُر از گیاە خشک

**پوشەلە** / pûşełe/: ☜ **پوشلە**

**پوشی** / pûşî/: ناو. ١. ڕووبەندی ژنان ٢. پووشوو؛

پیشۆ؛ پیفک؛ هەرچی زوو ئاگر بگرێ ۳. پۆپەی کەڵەشێر و بۆقلە و ... ☰ ۱. روبنده ۲. آتشگیره ۳. تاج برخی پرنده

**پووشین**[1] / pûşîn/: ناو. ۱. پۆشین؛ سەرپێچی ڕەشی ژنان ۲. پێشەسەر؛ خشڵی سەری ژنانە ☰ ۱. سرپوش سیاه زنانه ۲. زیور سر

**پووشین**[2]: ئاوەڵناو. دروستکراو لە لاسکە دەغڵ و گیا ☰ ساخته شده از ساقەی غلّه

**پووشینبەسەر** / pûşînbeser/: ☜ **پووشیندار**

**پووشینپۆش** / pûşînpoş/: ☜ **پووشیندار**

**پووشیندار** / pûşîndar/: ئاوەڵناو. خاوەن‌پووشین؛ پووشین‌بەسەر؛ پووشین‌پۆش ☰ دارای سرپوش سیاه زنانه

**پووشینە** / pûşîne/: ناو. زەنبیلە؛ تریانی لە پووش کراو ☰ سبد کوچک

**پووک**[1] / pûk/: ناو. ۱. پدوو؛ پوک؛ پیوو؛ پوو؛ پەوو؛ پی؛ پێ؛ هاروو؛ هاروە؛ ئاروو؛ لاوس؛ بن دنۆ؛ گۆشت ئاسایێکی نێو زاری زۆربەی مۆرغەداران کە ڕیشە و بنی ددان دادەپۆشێ و هی مرۆڤ سوور یان سوورکاڵە ۲. بن‌پێست ۳. چەپۆک؛ کاری بە پانی دەست لە سەر دان ٤. ☜ **پووکاوڵ** ٥. کرێوە؛ بەفر بە باوە ٦. لافاو؛ سێلاو ☰ ۱. لثه ۲. زیر پوست ۳. توسری ۴. ☜ **پووکاوڵ** ۵. کولاک ۶ سیلاب

**پووک**[2]: ئاوەڵناو. ۱. پووچ؛ بەتاڵ و ناوخاڵی ۲. لاواز ☰ ۱. تهی ۲. لاغر

**پووکاندنەوە** / pûkandinewe/: چاوگ. تێپەڕ. //پووکاندتەوە؛ دەپووکێنیەوە؛ بپووکێنەوە// پووچاندنەوە؛ کەم پێ کردن و چرچ هەڵگەڕاندن ☰ تباه کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپووکانەوە

**پووکانەوە** / pûkanewe/: چاوگ. تێنەپەڕ. //پووکایەوە؛ دەپووکێیەوە؛ بپووکێوە// پووچانەوە؛ کەم کردن و چرچ هەڵگەڕان ☰ تباه شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: پووکاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەپووکاندنەوە

**پووکاو** / pûkaw/: ئاوەڵناو. ۱. ڕزیو ۲. چرچ‌هەڵگەڕاو ☰ ۱. فرسوده ۲. چروکیده

**پووکاوڵ** / pûkawił/: ناو. پووکاوڵە؛ پوکاوڵە؛ پێنجۆک؛ چەمۆڵە؛ چەمبۆڵە؛ کەپوو؛ پووک؛ ئونگ؛ مۆتە؛ کەشکە؛ فێ؛ کاری کردنەوەی پەنجە و ڕوو بە کەسێک گرتنی بە نیشانەی بێزاری و تووک لێ کردنی ‹ئەمە کەی دینە کام ئیمام فەرمووی/ پووکاوڵت بێ خۆ تۆ ڕیش چەرمووی «قانع»› ☰ ام؛ حالت پنجەی باز بە سوی صورت شخصی گرفتن، به نشانەی تنفر

**پووکاوڵە** / pûkawłe/: ☜ **پووکاوڵ**

**پووکیر** / pukîr/: ☜ **پۆکەر**

**پووک‌و‌پێست** / pûk û pêst/: ناو. بەتاڵایی نێوان گۆشت و پێست ☰ فاصلەی میان گوشت و پوست

**پووکە**[1] / pûke/: ناو. ۱. بەری قامیش کە وەک لۆکە دەچێ ۲. قاپۆری گولله ۳. جۆرێ خرکەبەردی سووک و پتەو بۆ سەربانی خانوو ☰ ۱. ثمر نی که شبیه پنبه است ۲. پوکه ۳. پوکەی معدنی

**پووکە**[2]: دەنگەناو. گریان بە دەنگی نزم ☰ مویه

**پووکەپووک** / pûkepûk/: دەنگەناو. نووکەنووک؛ گریانی زۆر، بە دەنگی نزم ☰ گریەی آرام و طولانی

**پووگ** / pûg/: ناو. گژەبای زۆر توند ☰ تُندباد

**پوول** / pûl/: ناو. ۱. وردە؛ قۆشە؛ کەمترین نەغد ۲. سکەیەکی بچووکی لە مس بەرانبەری ۲۵ دینار کە لە سەردەمی قەجەردا برەوی هەبوو ☰ ۱. پَشیز ۲. از مسکوکات عهد قاجار

▣ **پوولە زەرنکە**: پوولەکەی چکۆڵەی زەرد کە دەکرێتە خشڵی ژنان ☰ پولک بُرنزی

**پوولک / pûlik/**: ناو. پوولەکە ماسی ⊑ فَلس ماهی

**پوولـە / pûle/**: نـاو. شـاباش؛ شـاواش؛ شـاواز ⊑ شاباش

**پوولەکـە / pûleke/**: نـاو. پوولـــەکە: ١. پـــەڕە وردەکانی پشـتی ماسـی ٢. پترۆخـە؛ پـەترۆک؛ قرتماغەی برین ٣. ئۆییە؛ بریقە ⊑ ١. فلس مـاهی ٢. کبرەی زخم ٣. پولک زینتی

**پوولەکی / pûlekî/**: ☜ **پوڵەکی**

**پووڵ / pûł/**: ناو. پارە؛ نەغد ⊑ پول

**پووڵپەرسـت / pûłperist/**: ناوەڵــناو. خەپووڵـــی؛ پارەخۆشەویست ⊑ پول‌پرست

**پووڵپەرەسـت / pûłperest/**: ناوەڵـناو. *[پـلار]* ڕژد و چنۆک؛ ڕەزیل ⊑ پولپرست

**پووڵـدار / pûłdar/**: ناوەڵـناو. دەوڵـەمەن؛ خـاوەن سامان ⊑ پولدار

**پووڵک / pûłik/**: ☜ **پوڵکە**

**پووڵکـە / pûłke/**: نـاو. پووڵـک؛ بریقـە؛ ئۆییـە ⊑ پولک زینتی

**پووڵگۆڕەوە / pûłgořewe/**: ☜ **پارەگۆڕ**

**پووڵەکە / pûłeke/**: ☜ **پوولەکە**

**پووڵەکـەدار / pûłekedar/**: ناوەڵـــناو. پووڵـــەڕێز ‹دەسمـــاڵ پووڵـــەکەدارن/ شـــەدە و گێلگێلـــە لارن «هێمن»› ⊑ پولکدار

**پووڵەکەڕێز / pûłekeřêz/**: ناوەڵـناو. تایبەتمەنـدی بەرگێ کە ئۆیە و بریقەی پێدا دووراببێ ⊑ پولکدار

**پووڵەکەماسی / pûłekemasî/**: نـاو. قرش ⊑ فلـس ماهی

**پووڵەکی / pûłekî/**: ناوەڵناو. *[پلار]* پوولەکی؛ ڕژد و چرووک؛ دەس‌قووچاو ⊑ پولکی

**پوون / pûn/**: ناوەڵناو. سیس و زەردهەڵگەڕاو (گیا) ⊑ زرد و ضعیف (گیاه)

**پـوونای / pûnay/**: چـاوگ. پوانـــدن؛ ڕزانـــدن ⊑ پوساندن

**پوونگە / pûnge/**: ☜ **پونە**

**پوونگەڕێوی / pûngeřêwî/**: ناو. جـاترە؛ تـەهتاوک ⊑ نعناع جویباری

**پوونگەکێویلـە / pûngekêwîle/**: نـــاو. جـــاترە؛ نەعنەکێویلە ⊑ نعناع کوهی

**پوونە / pûne/**: ناو. پونگـە؛ پینـە؛ پوینـە؛ پنگـە؛ پنـگ؛ پونـگ؛ پوونگـە؛ بودینـە؛ بنـەگیایـەکی خۆڕسکی یەک ساڵانە لە تیرەی نەعنا کە گەڵا و گوڵەکەی بۆ دەرمان دەشێ ⊑ پونە

**پـووە / pûwe/**: ناو. کەڕەپوو؛ گیامـەترەق؛ گیـای قامیشی کەڕەگۆشە ⊑ لوئی

**پوویای / pûyay/**: چاوگ. پوان؛ ڕزان ⊑ پوسیدن

**پوویڕ / pûyiř/**: ناو. پویـڕ؛ پوویـڕ؛ پـوڕ؛ تـالان ⊑ غارت؛ چپاول

**پووین / pûyîn/**: چـاوگ. دەباغ کـردن ⊑ دبّـاغی کردن

**پەپرووکـە / peprûke/**: نـــاو. بــــەورینگ؛ وردە سووتوویەک کە لە سەر ئـاور بـەرز دەبێتـەوە ⊑ خاکستر ریزی که هُرم آتش به هوا می‌برد

**پەپک / pepik/**: ناو. پاچە؛ پاچک؛ لاق و دەسـت لە سەروپێدا ⊑ پاچە

**پەپکـە / pepke/**: نـاو. ١. جــۆرێ کــولێرە ٢. خۆیانی خەرمان؛ خـەرمانی نـەکوتراو ٣. تۆڵـک؛ پەنیرە؛ نانەحاجی‌لەک‌لەک ٤. ئـەنگوتکی هـەویر ٥. پاپۆکە؛ کەوانە؛ کممە؛ خەپرە؛ ئاخلە؛ چەمـەر؛ هەر شتێکی ئالقەچن یا پێچەڵـپێچ ‹ئەڵـێی ئـەو زەرنەقووتەی پەپکە مارە فەرشی هێلانەی/ چ ئیشێکە کورم! بۆچی لە سەر ئەم هەڵکرووزانەی؟ «گـۆران»› ⊑ ١. نوعی گردەنان ٢. خرمن نکوبیده ٣. پنیـرک ٤. چونە ٥. چنبره

⊡ **پەپکە بەستن**: پاپۆکە دان؛ پەپکـە دان؛ پەپکـە خواردن (زۆرتر بۆ مار دەگوترێ، کاتێ خۆی وەک چەند ئالقەی لە سەر یەک کۆ دەکاتەوە) ⊑ چنبره

زدن

**پەپکە خواردن**: ☜ **پەپکە بەستن**

**پەپکە دان**: ☜ **پەپکە بەستن**

**پەپکەمەلیچک** / pepkemelîçik/: ناو. پەنیرە؛ پەنیرۆکە؛ تۆلک؛ نانەحاجیلە ☰ پنیرک

**پەپکەمەلیچکانە** / pepkemelîçkane/: ناو. تۆلک؛ پەنیرە؛ نانەحاجی لەک لەک؛ تۆلەکە؛ تۆلک؛ تۆڕکە؛ نان‌حاجی‌لەق‌لەق ☰ پنیرک

**پەپۆ** / pepo/: ناو. دەنکی میوە ☰ دانەی میوە

**پەپۆک**[1] / pepok/: ناو. کوندەبوو ☰ جُغد

**پەپۆک**[2]: ئاوەڵناو. کلۆل؛ ناعیلاج ☰ بیچارە

**پەپۆکە** / pepoke/: ناو. کولێرەی چکۆلە ☰ گردەنان کوچک

**پەپۆڵە** / pepole/: ناو. ئەنگوتکە نانی چکۆلە ☰ چونەی کوچک

**پەپوو**[1] / pepû/: ناو. ١. کوندەبوومە؛ کوندەبەبوو ‹ددان دەمیان بەجێ‌هێشتم، تەک‌وتووک/ لە ناو ویرانە ورتەی دێ پەپووی پووک! «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ٢. پەپووسلێمانە؛ بووبووکەرە؛ باڵدارێکی سەربە کلاوی بەناوبانگە ☰ ١. جُغد ٢. هُدهُد

⊡ **پەپوو خوێندن/ تیا خوەندن/ لێ‌خوێندن**: چۆڵ و هۆڵ بوون ☰ برهوت و خالی بودن

**پەپوو هەڵهێنان/ هەڵێنان**: *[مەجاز]* نەخۆشییەکی ئاژەڵە ☰ از بیماری‌های دام

**پەپوو**[2]: دەنگ. پەکوو؛ حەیف؛ مخابن ☰ کلمەی تأسف

**پەپووسلێمانکە** / pepûs(i)lêmanke/: ☜ **پەپووسلێمانە**

**پەپووسلێمانی** / pepûs(i)lêmanî/: ☜ **پەپووسلێمانە**

**پەپووسڵەمانکە** / pepûs(i)łemanke/: ☜ **پەپووسلێمانە**

**پەپووسڵێمانکە** / pepûs(i)łêmanke/: ☜ **پەپووسلێمانە**

**پەپووسڵێمانە** / pepûs(i)łêmane/: ناو. پەپووسلێمانی؛ پەپووسلێمانی؛ پەپووسولەیمانە؛ پەپووسولەیمانی؛ پەپووسێمانە؛ پەپووسڵەمانکە؛ پەپووسلێمانکە؛ پاپی‌سلێمونی؛ پاپی‌سلێموونی؛ پەپووسلێمانکە؛ پەپووسێمانە؛ پوپی؛ پەپووک؛ پەپووکەرە؛ پەشوو؛ بووبووکەرە؛ باڵندەیەک بە قەد کۆتر بە دندووکی باریک و زۆر بەهێز و سەری چکۆلەوە کە تاجێکی لە سەرە ☰ هُدهُد

**پەپووسڵێمانی** / pepûs(i)łêmanî/: ☜ **پەپووسلێمانە**

**پەپووسولەیمانە** / pepûsuleymane/: ☜ **پەپووسلێمانە**

**پەپووسولەیمانی** / pepûsuleymanî/: ☜ **پەپووسلێمانە**

**پەپووسێمانکە** / pepûsêmanke/: ☜ **پەپووسلێمانە**

**پەپووسێمانە** / pepûsêmane/: ☜ **پەپووسلێمانە**

**پەپووقژە** / pepûq(i)je/: ناو. باڵدارێکە وەک پەپووسلێمانە بەلام بێ کاکۆل ☰ پرندەای شبیە هُدهُد

**پەپووک**[1] / pepûk/: ☜ **پەپووسلێمانە**

**پەپووک**[2]: ئاوەڵناو. پەپوویک؛ ژار و بێچارە؛ بەستەزمان ☰ بیچارە

**پەپووکەرە** / pepûkere/: ناو. ١. کوندەبوو؛ بوو؛ بووم ٢. ☜ **پەپووسلێمانە** ☰ ١. جُغد ٢. ☜ **پەپووسلێمانە**

**پەپوولە** / pepûle/: ناو. پەروانە: ١. پەپی؛ شاپەریک؛ مینمینک؛ بەلاتیتک؛ بلاتینک؛ بەلاتینگ؛ بەلاتینک؛ بەلیتانک؛ بەلیتانگ؛ بەلبەلیتانگ؛ بەلبەلیناتگ؛ بەلبەلاسینگ؛ بەلاچیڤانۆک؛ پەلپەلیسک؛ باڵ‌فرنەک؛ پرپریک؛ پەرپەرک؛ پەرپەرۆک؛ پاپرتووک؛ پاپریک؛

هەپلووت؛ نمنمۆک؛ منمنک؛ جۆرێ مێرووی باڵدارە تا هەراش دەبێ، بە سێ قۆناغدا تێدەپەڕێ: گەرا، کرمۆکە و قۆزاخە ٢. ☜ پەپوولەکلك ≌ ١. پروانه ٢. ☜ پەپوولەکلك

**پەپوولە پایزە / pepûlepay(i)ze/**: ناو. پەپوولەپاییزە؛ پەپووەپاییزان؛ باویلکە؛ پشیلۆک؛ پشیلۆکە؛ پشیلەپایزە؛ پشیلەپاییزە؛ پشی‌پایزە؛ پشی‌پاییزە؛ باویلکە؛ گیایەکی ئالێکی پایایە، ساقەتەکەی ٤٠ سانتی‌میتر بەرز دەبێ و لە زۆر شوێناندا خۆڕسک دەڕوێ زۆرتر بە گوڵی ئەو گیایە دەگوترێ بە پەپوولەپایزە، کە خڕۆکەیەکی قژقژاویی زۆر سووکە و لەگەڵ بای سەر لە پایزان دێت و دەچێ. لە فەرهەنگی خەڵکدا، نیشانەی خۆشەویستی و هەواڵی خۆشە ≌ قاصدک

**پەپوولە پاییزە / pepûlepayîze/**: ☜ پەپوولەپایزە

**پەپوولەکلك / pepûleklik/**: ناو. پرپووچەڵە؛ پەپوولە؛ نەخۆشینی جەرگی ئاژاڵ ≌ از بیماری‌های دام

**پەپووەپاییزان / pepûwepayîzan/**: ☜ پەپوولەپایزە

**پەپویک**[1] **/ pepûyik/**: ناو. کوند؛ کەندەبوو؛ بوو ≌ جُغد

**پەپویک**[2]: ناوەڵناو. پەپووک؛ بەستەزمان؛ ناعیلاج ≌ بیچارە

**پەپە / pepe/**: ناو. ١. کولێرەی چکۆلە ٢. زەردێنەهێلکەی پان‌کراوەوەی سوورەوەکراو ≌ ١. گردە نان کوچک ٢. خوراکی از زردەی تخم‌مرغ

**پەپەچەورە / pepeçewre/**: ناو. پێ‌حاجیلە؛ تۆلک؛ پەنیرۆک ≌ پنیرک

**پەپەرک / peperik/**: ناو. تراویلکە؛ بەردەتراویلکە ≌ سراب

**پەپی / pepî/**: ناو. پەپوولە ≌ پروانە

**پەت**[1] **/ pet/**: ناو. ١. بەن ٢. گوریس؛ لەتە گوریس ‹بە پەتی درێژ کەرەکەی بەستەوە› ≌ ١. نخ ٢. رسن

▣ **پەتی سەوەتە:** [مەجاز] مرۆی سووک و بێ‌دەسەلات ≌ آدم بیکارە

▣ **پەت بڕین:** [کینایە] ١. شێت بوون ٢. تێ‌نەگەیشتن ٣. بەرەڵا بوون ≌ ١. دیوانە شدن ٢. نفهمیدن ٣. ول بودن

**پەت پساندن:** [کینایە] سەرکێشی کردن؛ کەڵەوەکێشی کردن؛ نافرمانی کردن ≌ نافرمانی کردن

**پەت خۆ هەڵخستن:** خۆ خنکاندن ≌ خود را حلق‌آویز کردن

**پەت کردن:** ١. گوریس دە مل خستن ٢. [کینایە] بە سووکایەتی هێنان ‹شەرتە شەرتی پیاوەتی بێ، گەر خوا دەستم بدا/ دوژمنت پەت کەم وەکوو سەگ، بیخەمە ژێر پێتەوە «فایەق بێکەس»› ≌ ١. رسن بە گردن انداختن ٢. آوردن با توهین

**پەت نەبڕین:** زۆر کول بوون (تیخ) ≌ کُند بودن

**پەت هەڵخستن:** ١. سێدارە هەڵخستن ٢. لە سێدارە دان، زۆرتر بۆ هەڕەشە دەگوترێ ≌ ١. دار برپا کردن ٢. دار زدن

**پەت**[2]: پێرۆ. ← لەت‌وپەت

**پەتا / peta/**: ناو. ١. ئاهۆ؛ ئازار؛ درم؛ نەخۆشی گیرۆ ‹بەر هەر نیگایەک و پەتایەکە/ ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت «سوارە»› ٢. پەسیو؛ هەڵامەت؛ ئالامەت ٣. هەویری نیوەنمەک و شەڵتەی گەرمی سەر برین ≌ ١. بیماری واگیر ٢. زُکام ٣. نوعی ضماد گرم کە بر زخم نهند

**پەتاتە / petate/**: ناو. پتەپتە؛ پوتێتە؛ سێفزەمینی؛ پەرەڵماسی ≌ سیب‌زمینی

**پەتاناسی / petanasî/**: ناو. درمناسی ≌ آفت‌شناسی

**پەتانی / petanî/**: ناو. پۆتە؛ خۆڵی زۆر ورد ≣ خاک نرم

**پەتانێ / petanê/**: ئاوەڵناو. پۆتە؛ یەکجار ورد ≣ بسیار ریز

**پەتبازی / petbazî/**: ناو. تەنافبازی؛ بە سەر پەتی ڕاهەنگێوڕاودا ڕۆیشتن ≣ بندبازی

**پەتبڕ / petbiř/**: ئاوەڵناو. *[پلار]* ١. سەربزێو ٢. بێتالیم ≣ ١و٢. افسارگسیخته

**پەتپساو / petp(i)saw/**: ئاوەڵناو. *[پلار]* پەتبڕ ‹وەک گوێلکی پەتپساو لە دەشتا/ بێهۆش دەگەڕێن بە شوێن بەهەشتا «هەژار، *بۆکوردستان*»› ≣ افسارگسیخته

**پەتپەتی / petpetî/**: ناو. ١. هەویری نیوەنمەک بۆ سەر برین ٢. *[مەجاز]* چۆنیەتی ئازار و تەفرە دان ٣. بەلا و کاری خراپ ≣ ١. ضماد خمیر ٢. بامبول ٣. مُصیبت

▣ **پەتپەتی پێکردن**: ١. دەستاودەست پێکردن؛ تەفرە دان؛ حەواڵە بە گەواڵە کردن ٢. بەلا بە سەردا هێنان و بەتایبەت ئابڕوو بردن ≣ ١. بە سر دواندن ٢. آبرو برای کسی نگذاشتن

**پەتپەتێن / petpetên/**: ناو. سووکایەتی؛ بێحورمەتی ≣ اِهانت

**پەترمە / petirme/**: ناو. ١. موتوربە؛ پەیوەندی دار ٢. کاری ئاوڵە کوتان ≣ ١. پیوند درخت ٢. مایەکوبی

**پەترۆ / petro/**: ناو. پەترۆخە؛ قرتماغە؛ قەتماخە؛ توێ؛ پەڕەی ناسکی سەر برین ‹شوکری خودا کە پەردەیی میحنەت دڕایەوە/ پەترۆی برینی عاشقی شەیدا کولایەوە «قانع»› ≣ کبرەی زخم

**پەترۆخە / petroxe/**: ☜ پەترۆ

**پەترۆک / petrok/**: ☜ پەترۆکە

**پەترۆکە / petroke/**: ناو. پەترۆک: ١. پەرتووک؛ پاژی زۆر بچووک ٢. پەترۆ ≣ ١. قطعەی کوچک ٢. کبرەی زخم

**پەترۆمە / petrome/**: ئاوەڵناو. بەترمەیی؛ تێکەڵ؛ لەخۆگری چەند وشە یان چەند شت ≣ مُرکب

**پەتشان / petşan/**: چاوگ. ڕزان؛ پوان ≣ فرسودن

**پەتشاندن / petşandin/**: چاوگ. داڕزاندن ≣ فرسودە کردن

**پەتک / pet(i)k/**: ناو. ١. لەتە گوریس ‹شیعری خەڵقی کەی دەگاتە شیعری من بۆ نازکی/ کەی لە دیققەتدا پەتک دەعوا لەگەڵ هەودا دەکا؟! «نالی»› ٢. تلپی دانی ڕۆنلێگیراو ≣ ١. رَسَن ٢. تفالەی دانەی روغنی

▣ **پەتک نەبون**: *[مەجاز]* هیچ نەبوون؛ سووک و چرووک بوون ‹من لە لای تۆ پەتکیش نیم› ≣ بیارزش و بیمقدار بودن

**پەتکینە / petkîne/**: ئاوەڵناو. بە یەک شیش چنراو (بۆ گۆرەوی دەگوترێ) ≣ با یک میلە بافتە شدە (جوراب)

**پەتکێش / petkêş/**: ناو. خاوکێش؛ کاری لێدان و پەتپەتی پێ کردن ≣ کُتککاری

**پەتلە / petle/**: ناو. ١. ساوار؛ ساوەر ٢. دانەوێڵە ٣. گەنمی کوڵاوی دە ئاودا ساردەوەکراو بۆ خواردن ≣ ١. بلغور ٢. بُنشن ٣. گندم پُختە

**پەتۆ / peto/**: ناو. ١. هەناسە؛ دەم ٢. پەتوو؛ بەتانی ≣ ١. دم؛ نفس ٢. پتو

**پەتۆت / petot/**: ئاوەڵناو. پرتووکاو؛ پواو ≣ پوسیدە

**پەتۆر / petor/**: ئاوەڵناو. شڕ؛ دڕاو ≣ پارە

**پەتۆن / peton/**: ناو. پشوو؛ هەناسە ≣ نفس

**پەتو / petû/**: ناو. بەتانی؛ بەتانیە؛ ئەدیال ≣ پتو

**پەتورە / petûre/**: ئاوەڵناو. کۆن و شڕ ≣ مُندرس

**پەتوکیای / petûkyay/**: چاوگ. پرتووکان ≣ فرسودن

**پەتە / pete/**: ناو. ١. پسوولە؛ بلیت؛ جەواز ٢. چۆنیەتی پێژانی نان ≣ ١. بلیت ٢. پُخت (نان)

⊡ **پەتە خستنە سەر ناو:** *[کنایە]* ڕیسوا کردن؛ ئابڕوو بردن. هەروەها: **پەتە کەوتنە سەر ناو** ☰ رسوا کردن

**پەتەر / peter/:** ناو. بەلا؛ چۆرتم ☰ مُصیبت

**پەتەری / peterî/:** ناوەڵناو. *[پلار]* پەتیارە؛ شێتۆکە؛ گەللایی ☰ پتیارە

**پەتەسو / petesû/:** ناو. خۆڵەمێش؛ بووڵ ☰ خاکستر

**پەتەفینگە / petefînge/:** ناو. پەتەڤینگە؛ قەڵماسک ☰ فلاخن

**پەتەڤینگە / petevînge/:** ☜ **پەتەفینگە**

**پەتەی / petey/:** چاوگ. ١. پێژان (بۆ نان) ٢. کوتان؛ لێدان ☰ ١. پُختن ٢. کتک زدن

**پەتی / petî/:** ناوەڵناو. ١. ڕووت؛ خواس ‹پای پەتی› ٢. بێخەوش؛ ناتێکەڵاو ‹ڕۆنی پەتی› ٣. خاڵی؛ تەنیا ‹نانی پەتیشمان نییە› ٤. ئاشکرا؛ بێپەردە ‹هەمووی درۆن، درۆی پەتی! «پەشێو»› ☰ ١. پَتی؛ برهنه ٢. خالص؛ ناب ٣. خالی؛ خشک و خالی ٤. آشکار

**پەتیارە / petyare/:** ناوەڵناو. *[پلار]* پەتەری؛ شێتۆکە؛ گەللایی ‹هەر بە ئاخ و داخەوە دەتلێتەوە/ شێت و پەتیارە لە کێو دەخولێتەوە «شاوات»› ☰ پتیارە

**پەتیتە / petîte/:** ناو. تۆبە ☰ توبە

**پەتیس / petîs/:** ناو. زەرەر ☰ زیان

**پەچ**[1] **/ peç/:** ناو. ١. پەرچ ٢. دڵۆپێک لە بنێشت ☰ ١. پرچ ٢. تکّەی سقز

⊡ **پەچ دان/ دانەوە:** خوار و پان کردنەوەی بزمار و... ☰ پرچ دادن

• **پەچ**[2]**:** پاشەوشە. ـ پێژ ☰ ـ پز

**پەچک / peçik/:** ناو. بەچک؛ بیچم ☰ سر و سیما

ـ **پەچن / peçin-/:** پاشەوشە. ـ چن؛ ـ چین؛ وەسەرنراو ‹قەلاپەچن› ☰ ـ چین

**پەچنین / peçnîn/:** چاوگ. تێپەڕ. //پەچنیت؛ دەپەچنی؛ بپەچنە// پڕ کردنی وا کە جێگەی چیتر نەبێتەوە ☰ انباشتن؛ آکندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپەچنین

**پەچوە / peçwe/:** ☜ **پەرچ ـ١**

**پەچە / peçe/:** ناو. ١. ڕووبەند؛ ڕووبەنە؛ ڕووبەن؛ پێچە؛ پووشی؛ خێلی؛ پارچەیێ کە ڕوومەتی پێ دادەپۆشن (بەتایبەت ژنان) ‹هەتا لاو بووم چاوی جوانم لێ ون بوو/ پەچە و ڕووبەند و چارشێوم دوژمن بوو «هێمن»› ٢. کاری پێژان (نان) ٣. حەوشە؛ مۆڵ؛ جێ خەوی مێگەل لە دەشت ‹هەر کە لەو ڕانە! با بچێ بۆ پەچە› ☰ ١. روبنده ٢. پُخت (نان) ٣. شبغاز گلّه

**پەچەتە / peçete/:** ناو. بەروانکەی نان خواردن ☰ پیشبند غذاخوری

**پەچەخوز / peçexûz/:** ناو. کاری مالات کردنە ناو جاڕ و زەوی، بۆ ئەوەی پشکەڵەکەیان ببێتە کوود ☰ عمل گله را داخل زمینی کردن برای کودگیری

**پەچەڕان / peçeřan/:** ناو. پەچەمەڕ؛ هەوێز؛ پەچەی مێگەل ☰ شبغاز گله

**پەچەڵ / peçeł/:** ناوەڵناو. چەپەڵ؛ گەمار؛ پیس؛ پۆخڵ ☰ کثیف

**پەچەمەڕ / peçemeř/:** ☜ **پەچەڕان**

**پەح / peĥ/:** دەنگ. پەحا؛ وشەی سەیرمان ☰ کلمەی تعجب

**پەحا / peĥa/:** ☜ **پەح**

**پەحتن / peĥtin/:** چاوگ. پێژانی نان ☰ پُختن نان

**پەححا / peĥĥa/:** دەنگ. وشەی سەیرمان بە باوڕ نەکردنەوە ‹پەححا لەم درۆیە!› ☰ کلمەی تعجب و انکار

**پەحلەوان / peĥlewan/:** ☜ **پاڵەوان**

**پەحن / peĥn/:** ☜ **پان**

**پەحنی / peĥnî/:** ناو. پاژنە؛ پانیە ☰ پاشنە

**پەحین** / peĥîn/: ☜ **پەخین**

**پەخ**[1] / pex/: ئاوەڵناو. ١. کول؛ نەتیژ ‹خەنجەرا تـە پەخ بوویە› ٢. کەل؛ کل؛ گۆشەنەماو ⚑ ١. کُند ٢. یَخ

⊡ **پەخ بون** ١. سوان و کول بوونی تیغ ٢. کەل بوون ⚑ ١. کُند شدن تیغ ٢. یَخ شدن

**پەخ**[2]: دەنگ. *[منداڵانە]* پەخخـە!؛ بـەخ!؛ وشـەی پەسند کردن ⚑ بە!

**پەخخە** / pexxe/: ☜ **پەخ**[2]

**پەخش** / pexş/: ئاوەڵناو. بـڵاو؛ پـرژاو ‹هـەر وەک بەرەزا پەخشە، ئەگریجە لە سـەر خاڵـی «نـالی»› ⚑ پخش؛ پراکندە

**پەخشان**[1] / pexşan/: نـاو. ١. وێژامـــە؛ وەژەگ؛ نثیسکی؛ نووسراوەی ئاسایی بەبێ تایبەتمەنـدی شیعر ٢. بەش؛ دابەش ‹ڕەقس و فەرەح و کەیفە لە هەر گەنج و پیاوێ/ مەی خواردن و پەخشانە لە هـەر کاڵ و کولاوێ «قانع»› ⚑ ١. نثر ٢. توزیع

**پەخشان**[2]: ئاوەڵناو. پـەخش ‹زولفـی پەخشـان› ⚑ پراکندە

⊡ **پەخشان بون** بلاو بوون؛ پرژان ⚑ پریشان بودن

**پەخشان کردن** بلاو کردن؛ پرژاندن ⚑ پراکندن

**پەخشان کردنەوە** بلاو کردنـەوە؛ بـەش ـ بـەش کردنەوە ⚑ توزیع کردن

**پەخشانگا** / pexşanga/: ناو. دەزگای چاپ و بلاو کردنەوە ⚑ انتشارات

**پەخشـە** / pexşe/: نـاو. ١. بلاڤـۆک؛ بەلاڤـۆک؛ نووسراوە بۆ چاپ و بـڵاو کردنـەوە ٢. مێشـوولە؛ پەخشەکۆرە؛ پەخشـەکوورە؛ تۆفانـە ‹هـەر کـەس پـوول نـەیری خـەرگی خەسـە/ سەرکیشـی کـەری پەخشە و مەگەسە «شامی»› ⚑ ١. نشریە ٢. پشە

**پەخشەکۆرە** / pexşekore/: ☜ **پەخشە ـ٢**

**پەخشەکورە** / pexşekûre/: ☜ **پەخشە ـ٢**

**پەخشین** / pexşîn/: چاوگ. بلاو کردنەوە ⚑ پخش کردن

**پەخمە** / pexme/: ئاوەڵناو. گێل؛ دەبەنگ؛ سەپۆل ⚑ پخمە

**پەخوا** / pex(i)wa/: ناو. پێخوێ؛ کلۆشی بـەرپێی گاگێرە ⚑ خرمن درحال کوبیدن

**پەخە** / pexe/: دەنگ. بەخ؛ ئۆخەیش ⚑ آخش

**پەخین** / pexîn/: ناو. پەحین؛ لەقە؛ پێلاقە ⚑ لگد

**پـەر** / per/: ئاوەڵناو. سەر و گەردن ڕەش (بۆ مەڕ و بەرخ) ‹ئامان شیرین سەوز! بەرخە پەرەکەم!/ ڕەفێق ڕێگەی چۆل، غەم دەرکەرەکەم! «فولکلۆر»› ⚑ سفیدِ سر و گردن سیاە (دام)

**پەرا پەسەرێ** / perapeserê/: ☜ **پەراوەرێ**

**پەراسوە** / peras(i)we/: ناو. قامیشی ڕایەڵی چیغ و... ⚑ شاخەهای نی در آلاچیغ

**پەراسـو** / perasû/: نـاو. ١. پەراسـێ؛ پارەســتوو؛ پارەهەستوو؛ پارسوو؛ دەندە؛ دەنە؛ دەن؛ دەنـگ؛ دەنــک؛ دەنکــە؛ پەرەکــە؛ سیســـێ؛ پارخـــان؛ پاروخان؛ ئێسکی کەوانەیی سەر سینگ و پشت ٢. *[مەجاز]* پاڵ؛ تەنشت ٣. قامیشی ڕایەڵی چیغ و کەپر ⚑ ١. دندە ٢. کنار ٣. تارهای نی در آلاچیغ

**پەراسوبەند** / perasûbend/: ناو. دەفـەی سـنگ ⚑ جناغ سینە

**پەراسـوخوار** / perasûx(i)war/: ئاوەڵـناو. *[مـەجاز]* فێڵباز؛ ساختەچی ⚑ حیلەگر

**پەراسوشکاو** / perasûş(i)kaw/: ئاوەڵناو. پاڵووپساو ⚑ جناغ‌شکستە

**پەراسی** / perasî/: ☜ **پەراسو ـ١**

**پەراڤ** / perav/: نـاو. ڕۆخ؛ کنارێن؛ قەراخی ئاو ⚑ ساحل

**پەراگەنـدە** / peragende/: ئاوەڵـناو. ١. لـە گـەل دابڕاو؛ لە یەک دابڕاو ‹لە کۆ ئەسرین دەبارێنم، لە بۆ کوردی پەراگەندە/ لە گەرمێن غەرقی ئـارەق بـووم و چاوم هـەر لـە سـامرەندە! «هـێمن»› ٢. ئـاوەکی؛

حەیوانی لە مێگەل دوور کەوتوو ▤ ١. پراکندە ٢. از گلە دور افتادە

**پەرانتێز** / perantêz/: ناو. کەوان () ▤ پرانتز ()

**پەراو** / peraw/: ناو. ئاودەست؛ کناراو؛ کەناراو ▤ مُستراح

**پەراوەرێ** / perawerê/: ناو. پەراوەرێکە؛ پەراپەسەرێ؛ بەسرپێر؛ بەترپێرێ ▤ پس‌پریروز؛ سە روز پیش

**پەراوەرێکە** / perawerêke/: ☜ پەراوەرێ

**پەراوێز** / perawêz/: ناو. پەراوێز؛ پەڕ؛ کەنارە؛ کەنار؛ قەراخ؛ کەف؛ زێوار؛ ئاوێز؛ گلەر؛ کەنارەی هەر شتێ ‹جەو بۆنە فەردم ئیستیفابێزەن/ دامەش لایق ئی پەراوێزەن «؟»› ▤ حاشیە

**پەرایی** / perayî/: ناو. سرویس؛ ڕاژە؛ خزمەت ▤ سرویس

**پەرپتاندن** / perp(i)tandin/: چاوگ. پێچ دان ▤ پیچ دادن

**پەرپتین** / perp(i)tîn/: چاوگ. پێچ خواردن ▤ پیچ خوردن

**پەرپینە** / perpîne/: ☜ پەلپینە

**پەرت** / pert/: ئاوەڵناو. ١. سەهوکار؛ گەنەکار ٢. سەرنخوون؛ سەرەوخوار ▤ ١. اشتباه‌کار ٢. واژگون

**پەرتاڵ** / pertal/: ناو. کووتاڵ ▤ قُماش

**پەرتان** / pertan/: چاوگ. ١. پارچە ـ پارچە بوون ٢. ڕووتانەوە؛ ڕووتەو بوون ▤ ١. تکە ـ تکە شدن ٢. بی‌برگ شدن

**پەرتاندن** / pertandin/: چاوگ. ١. پارچە ـ پارچە کردن ٢. ڕووتاندن؛ ڕووتەو کردن ▤ ١. تکە ـ تکە کردن ٢. بی برگ کردن

**پەرتاوتن** / pertawtin/: چاوگ. تێپەڕ. //پەرتاوتت؛ دەپەرتێوی؛ بپەرتێوە// پەڕتاوتن؛ هەڵپاچینی دار ▤ هرس کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپەرتاوتن

**پەرتاوتە** / pertawte/: ئاوەڵناو. هۆرپاتە؛ هەڵپاچراو ▤ هرس شدە

**پەرتووک** / pertûk/: ناو. پەڕتووک؛ کتێب ▤ کتاب

**پەرتەک** / pertek/: ناو. هێز؛ وزە؛ توان ▤ نیرو

⊡ **پەرتەک بڕیان**: هێز لێ بڕان ▤ از رمق افتادن

**پەرتین** / pertîn/: چاوگ. تووک و پەڕ لێ‌بوونەوە ▤ هَرس شدن

**پەرجان** / percan/: ناو. چیلە؛ پەرژین ▤ پرچین

**پەرجۆ** / perco/: ناو. پەرجوو؛ پەرچۆ؛ پەرژوو؛ پەرهێن؛ مۆجزات؛ ڕووداوی سەیر و سەمەرە و دوور لە پێوەری عەقڵ ▤ مُعجزە

**پەرجوو** / percû/: ☜ پەرجۆ

**پەرچ** / perç/: ناو. ١. پەچ؛ پەچوە؛ پەر؛ جۆرێک بزماری سەرپان بۆ لکاندنی چەند پاژ (وەک ئاسن) پێکەوە ٢. پەرژین؛ چیل ٣. سەرلکی هەڵپەرتاوتە ٤. مێشە و لێڕی چوغور ٥. بەرپەرچ؛ زیچ ٦. پرچ؛ زولف ٧. لەمپەر؛ تەگەرە ▤ ١. پَرچ ٢. پَرچین ٣. شاخەی پیراستە شدە ٤. بیشەی انبوە ٥. واکنش ٦. زُلف ٧. مانع

⊡ **پەرچ دانەوە**: ١. خوار کردنەوە و خەواندنی بزمار و ... ٢. پێشەبڕە بڕینەوە لە ڕێگە ٣. وەرامی قورس دانەوە ▤ ١. پرچ دادن ٢. پیشی گرفتن ٣. جواب سخت دادن

**پەرچ کردن**: پەچ کردن؛ پێکەوە نووساندنی دوو پارچە بە پەرچ ▤ پرچ کردن

**پەرچان**[1] / perçan/: چاوگ. ١. خوار کردنەوەی بزمار و ... ٢. پان بوونەوە ▤ ١. خواباندن میخ و ... ٢. وارفتن

**پەرچان**[2]: ناو. تامان؛ پەرژین ▤ پرچین

**پەرچاندن** / perçandin/: چاوگ. پەرچانن؛ نووشتاندنەوە ▤ خم کردن

**پەرچانن** / perçanin/: ☜ پەرچاندن

**پەرچاوە** / perçawe/: ئاوەڵناو. خوارەوە بوو ▤ پرچ

داده شده

**پەرچڤ** / perçiv/: ناو. بـا؛ مـاس؛ ئەسـتووری ف ورم؛ آماس

**پەرچڤان** / perç(i)van/: چاوگ. ۱. هەڵامسان؛ با کردن؛ ماس هاوردن ۲. قەڵەشـان؛ تلیشـیان ۳. ورد و خاش بوون ف ۱. آماسیدن ۲. شکاف برداشتن ۳. خُرد شدن

**پەرچڤانـدن** / perç(i)vandin/: چـاوگ. ۱. هەڵامساندن؛ ماساندن ۲. قەڵەشاندن؛ تلیشاندن ۳. ورد و خاش کردن ‹کاوەی ئاسنگەر باڤ و کالێ من/ پەرچڤاند سەرێ زەحاکێ دژمن «جگەرخوێن»› ف ۱. آماساندن ۲. شکاف دادن ۳. خُرد کردن

**پەرچڤین** / perç(i)vîn/: چاوگ. با کردن؛ ماسین؛ ئەستوور بوون ف آماسیدن

**پەرچق** / perçiq/: ناو. وردە؛ ورتکە؛ پراش ف ریزە

**پەرچقان** / perç(i)qan/: چاوگ. پەرچقین؛ ورد و خاش بوون؛ لەتوکوت بوون ف تکەپارە شدن

**پەرچقاندن** / perçiqandin/: چاوگ. ورد و لـەت کردن ف تکەپارە کردن

**پەرچقین** / perç(i)qîn/: ☜ **پەرچقان**

**پەرچۆ** / perço/: ☜ **پەرجۆ**

**پەرچووکە** / perçûke/: ناو. مووی لە سـەر هەنیـە قرتاو ‹پەرچووکە لە سەر هەنی بنەخشـێ/ کـێ بـێ دڵ و گیانی پێنەبەخشێ «هەژار، مەم و زین»› ف موی بر پیشانی

**پەرچە** / perçe/: نـاو. ۱. پارچـە؛ پـاژ؛ لـەت ۲. کووتاڵی گرانقیمەت ف ۱. جزء ۲. پارچەی قیمتی

**پەرچەکردار** / perçekirdar/: نـاو. کاردانـەوە ف واکنش

**پەرچەم** / perçem/: نـاو. ۱. پەرچووکـە؛ مـووی سەر هەنیە ‹هەر پەرچەم و پێشانییە فیکری شـەو و ڕۆژم/ هەر گـەردەن و زولـفە ئەمـەلی دوور و درێـژم «نالی»› ۲. ئالا؛ پەرچـەم؛ عەلـەم ف ۱. مـوی بـر پیشانی ۲. پرچم

**پەرچی** / perçî/: پێرۆ. ← **هەرچیوپەرچی**

**پەرخ** / perx/: نـاو. کـاری شـێلان و بـە دەسـت مالین ف مالش

**پەرخانـدن** / perxandin/: چـاوگ. ۱. شـێلان؛ هەڵشێلان ۲. خوراندن؛ خاراندن ۳. پلیخاندنەوە؛ تلیقاندنەوە ٤. شێواندن؛ تێکدان ف ۱. مالیدن ۲. خاراندن ۳. لە کردن ۴. بە هم زدن

**پـەرخین** / perxîn/: چـاوگ. ۱. پلـیخانەوە؛ تلیقیانەوە ۲. هەڵکەنران؛ کنیانـەوە ۳. شـێویان؛ تێکدران ف ۱. لە شدن ۲. کندە شـدن ۳. بـە هـم ریختن

**پەرداخ**[1] / perdax/: ناو. پەرداغ: ۱. لیوان؛ گلاس؛ پیاڵەی ئاوخۆری لە شیشە ۲. پـەرداخت؛ کـاری جـوان و لـووس کـردن ‹ئـەو تەختەنـەردە جـارێ پەرداخ نەکراوە› ف ۱. لیوان ۲. پرداخت

**پـەرداخ**[2]: ئاوەڵناو. پـەرداغ: ۱. سـاز و بەکـەیف ‹پاشەرۆکێکی بکەم لەم باخە/ تاکوو باڵ و پەڕی مـن پەرداخـە «سـوارە»› ۲. چـاخ؛ تـەیار؛ گـیف ف ۱. سرحال ۲. مُهیّا

**پەرداخت** / perdaxt/: ☜ **پەرداخ[1]ـ۲**

**پەرداخی** / perdaxî/: ئاوەڵناو. لیـوانی؛ لیـوانی ف لیوانی

**پەرداغ** / perdağ/: ☜ **پەرداخ**

**پـەردۆخنای** / perdoxnay/: چـاوگ. پرووزانـدن؛ هەڵپرووزاندن ف سوزاندن پشم و مو

**پەردۆخیای** / perdoxyay/: ☜ **پەردوخیان**

**پەردۆژ** / perdoj/: ☜ **پەردەژ**

**پەردو** / perdû/: ناو. پردوو: ۱. پەردەی بـووک و زاوا؛ ژووری بـووک و زاوا لـە شـەوی بـووک گوێزانەوە ۲. هەڵاشی بان ‹ڕیزێ کۆلیتی هـەیوان گـێچ خـواردوو/ دیـوار داڕووخـاو، بـێ دار و پـەردوو «قانع»› ف ۱. حجلە ۲. پودە

**پەردوخ / perdûx**/: ☜ **پروز**

**پەردووخیان / perdûxyan**/: چاوگ. پــرووزان؛ پەردۆخیای؛ سووتانی موو ⌂ سوختن پشم و مو

**پەردووژ/ perdûj**/: ☜ **پەردەژ**

**پەردووگیر / perdûgîr**/: ئاوەڵناو. لە پەردوودا مردوو یان نەخۆش کەوتوو (بۆ تازەزاوا دەگوترێ) ⌂ در حجله مُرده یا مریض شده (داماد)

**پەردە / perde**/: ناو. ١. پای؛ رووپۆشــی دەرگــا و پەنجەرە لە قوماش ٢. [کالبدشناسی] توێژی تــەنک لە شانە کە ئەندامێکی لـەش دادەپۆشــێ یـا دوو ئەندام لـە یـەکتر دادەبـڕێ ‹پـەردەی گـوێ› ٣. پەردەی شانۆ؛ بەشێک لە شـانۆ کـە لـە مـەودای چوونە سەر و هاتنە خـواری پەردەیێکـدا پیشـان دەدرێ ‹لەوێوە بووک تا سەوسێنان بـردن/ بینـینی هەر دوو پەردەی ژنبەژن «گۆران»› ٤. پارچە یـان دیوارێکی سپی کە فیلمی لە سەر پیشان دەدەن ‹ئەو فیلمـە هێشـتا لـە سـەر پەردەیـە› ٥. [مۆسیقا] مەودای نێوان نۆتەکانی مووسـیقا ٦. پـەردوو ٧. لا؛ توێ ⌂ ١. پرده ٢. غشا ٣. پرده؛ بخش نمایشی ٤. پردەی سینما ۵. پردەی موسیقی ۶. حجله ٧. لایه

◘ **پەردە دڕان**/[مـەجاز] ١. رووسـیا بـوون؛ ئـاوڕوو چوون ٢. شەرم شکان ⌂ ١. رسوا شدن ٢. شرم ریختن

**پەردە لـە چـاودا نەبـوون**/[مـەجاز] ڕووڕاســت و بێڕوودەربایسی بوون ‹بە خوا پـەردەم لـە چـاوا نییە، ئـەوەی دەیـزانم، دەیڵـێم› ⌂ رودربایسـتی نداشتن

**پەردەپڵاو / perdep(i)ław**/: ناو. جۆرێ پڵاوە کـە تۆتۆی گۆشتی تێدایە ⌂ چلوگوشت

**پـەردەپۆش / perdepoş**/: ئاوەڵـناو. [مـەجاز] ڕازدار؛ ئەمین بۆ سڕ نەدرکاندن ⌂ رازدار

**پـەردەچیای / perdeçyay**/: چـاوگ. پـــەرژان ⌂ مشغول شدن

**پـەردەدار / perdedar**/: نـاو. خزمــەتکاری ژووری تایبەتی حاکمان ‹بە موقەرڕەبان بارەگای عیززەت/ بە پەردەداران سەریر وەحدەت «مـەولانا خالـد»› ⌂ پردەدار

**پەردەژ / perdej**/: ئاوەڵـناو. پـەردۆژ؛ پـەردووژ: ١. داڕەت؛ لـە بەردەســت ٢. [مـەجاز] بووزخـۆر؛ بـە تایبەتمەندی بووز خواردن ‹لە کاری دیش وەکـوو دەرس و موتالا/ ئەگەر پـەردەژ نـەبێ، نـەتبێ سـکالا «؟»› ⌂ ١. در دسترس ٢. مُمکن

**پەردەژی / perdejî**/: ناو. پەردەوژ: ١. چۆنیەتی لە دەسترەس بوون ٢. بووزخۆری ⌂ ١. دسترسی ٢. امکان

**پـەردەک / perdek**/: نـاو. ١. مەتــەڵ؛ لەغــەز؛ مەتەڵۆکە ٢. نەرێساتی؛ کینایە ⌂ ١. چیستان؛ لُغز ٢. کنایه

**پـەردەگیر / perdegîr**/: ئاوەڵــناو. بەســـراو؛ لـــە پەردوودا هـیچ پـێ نـەکراو (زاوا) ‹زاوا پـەردەگیر، بووک ڕەشپۆش بکرێ/ جلی زاوایی بە کۆتەڵ بکرێ/ نانی شایەکەت بە شـیوەن بخـورێ «فولکلـۆر»› ⌂ پردەگیر (داماد)

**پەردەوژ / perdewj**/: ☜ **پەردەژی**

**پەردەهـەناو / perdehenaw**/: نــاو. چەقاڵـــتە؛ کراسبەز؛ پەردەی تەنک و دوو تۆی نـاو زگ کـە هەناو و هەموو ئەندامەکانی دادەپۆشێ ⌂ صِفاق

**پەردێژ / perdêj**/: ناو. هەل؛ دەرفـەت؛ کـێس ⌂ فُرصت؛ مجال

**پەرزنای / perznay**/: چاوگ. پالاوتن ⌂ پالودن

**پەرزوانـە / perz(i)wane**/: نـاو. فیلتــر؛ پالــوانە؛ پاڵوێنە ⌂ فیلتر

**پەرزیای / perzyay**/: چاوگ. پاڵـێوران ⌂ پـالوده شدن

**پەرژ / perj**/: ناو. هەل؛ دەرفەت ⌂ فُرصت

**پەرژان**[1] **/ perjan**/: ناو. چاوگ. پـەرژیان؛ پـەرژین:

١. دەرفەت هەبوون؛ کات هەبوون ‹نامپەرژێ سەرم بخورێتم!› ٢. خەریک بوون ‹نەیپەرژاوەتە خەلە و خەرمانی/ هەموو جێ ماون ئیش و فرمانی «قانع»› ٣. گرینگی پێ دان ☰ ١. فرصت داشتن/ یافتن ٢. پرداختن؛ مشغول شدن ٣. اهمیت دادن

**پەرژان**[٢]: ناو. پەرژین؛ تامان ☰ پرچین

**پەرژاندنەوە** / perjandinewe/: چاوگ. چاوەڕێی کەسێ تر بوون و خۆ لە کار بواردن ☰ بە امید دیگری کار را زمین گذاشتن

**پەرژاو** / perjaw/: ئاوەڵناو. لەگژ؛ خەریک ☰ مشغول

**پەرژوبڵاو** / perj û b(i)ław/: ☜ **پرژ و بڵاو**

**پەرژو** / perjû/: ☜ **پەرجۆ**

**پەرژیان** / perj(i)yan/: ☜ **پەرژان**[١]

**پەرژین**[١] / perjîn/: ☜ **پەرژان**[١]

**پەرژین**[٢]: ناو. چیل؛ شوورەی بە دروو ☰ پرچین

⊡ **پەرژین کردن**: *[مەجاز]* پاراستن ‹چاوی من بەحری موحیتی تۆیە بۆ دەفعی گەزەند/ لێت موعەیین بێ کە نالی گوڵ بە دڵ پەرژین دەکا «نالی»› ☰ مُحافظت کردن

• **پەرس** / peris-/: پاشەوشە. ـ پەرست؛ ـ پەرەس؛ ـ پەرەست ‹خواپەرس› ☰ ـ پرست

**پەرسای** / persay/: چاوگ. پرسین ‹پەرسام سیرڤانی چی بێدەنگەنی/ یا زمسان ئامانیا وێت سەردەنی «فولکلۆر»› ☰ پرسیدن

• **پەرست** / perist-/: پاشەوشە. ـ پەرس؛ ـ پەرەس؛ ـ پەرەست ‹ئەم پارەپەرستانە لە خۆیان کە دەچن زوو/ دەخلی نە پەلی دێوە، نە بای باڵی پەری بوو «مەحوی»› ☰ ـ پرست

**پەرستار** / peristar/: ناو. پەرەستار: ١. خەمخۆر؛ کەسێ کە کاری پێخۆردان، پۆشتە کردن، خەواندن و پاک و خاوێن کردنەوەی کەسێکی (بەتایبەت منداڵ، پیر و زورهان یا نەخۆش) وە ئەستۆیە ٢. ئەوەی ڕاهاتووە لە ژێر چاوەدێری بژیشکدا، دەستووری دەرمانی بەڕێوە دەبا ‹پزیشکم شەرمەزار بۆوە کە نەیتوانی بکا چارم/ دەبێ هیوام بە مان چەند بێ کە ڕەشپۆشە پەرستارم «هێمن»› ☰ ١و٢. پرستار

**پەرستاری**[١] / peristarî/: ناو. پەرەستاری: ١. کاری پەرستار ٢. چاوەدێری و خزمەتکاری لە کەس یا کەسانێک (بەتایبەت نەخۆش، منداڵ یان پیر) کە ناتوانن کار و باری خۆیان بەڕێوە بەرن ‹چەند ساڵ لە دایکی پەرستاری کرد› ☰ ١و٢. پرستاری

**پەرستاری**[٢]: ئاوەڵناو. پەرەستاری؛ سەر بە پەرستار ‹جل‌وبەرگی پەرستاری؛ فێرگەی پەرستاری› ☰ پرستاری

**پەرستران** / perist(i)ran/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //پەرسترایت؛ دەپەرەستریێ؛ بپەرستریێ// پەرەسین؛ پەڕەستن؛ بە پیرۆز زانین و بڕوای تەواو پێ هەبوون ☰ پرستیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: پەرستراو/ چاوگی نەرێنی: نەپەرستران

**پەرستن** / peristin/: چاوگ. تێپەڕ. //پەرستت؛ دەپەرەستی؛ بپەرستە// پەرەسین؛ پەڕەستن؛ بە پیرۆز زانین و بڕوای تەواو پێ هەبوون ☰ پرستیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپەرستن

**پەرسدار** / per(i)sdar/: ناو. خواپەرست ☰ خداپرست

**پەرسف** / persif/: ناو. وەڵام؛ وەرام؛ جواب ☰ پاسخ

**پەرسڤ** / persiv/: ناو. جواب؛ وەڵام؛ وەرام ☰ پاسخ

**پەرسڤدەر** / persivder/: ناو. وەڵامدەر؛ وەرامدەر ☰ پاسخگو

**پەرسگە** / perisge/: ناو. پرێسگا؛ جێگەی نزا و

پارانەوە 🇮🇷 پرستشگاه
**پەرسە** / perse/: ☜ **پرسە**
**پەرسیار** / perisyar/: ناو. پەرست 🇮🇷 پرستندە
**پەرسیای** / perisyay/: چاوگ. پرسـران؛ پرسـیان 🇮🇷 پرسیدە شدن
**پەرسیف** / persîf/: ☜ **پەرسیو**
**پەرسیلە** / persîle/: ناو. بەرسیلە؛ پەسیلە؛ قۆرە 🇮🇷 غورە
**پەرسیو** / persîw/: نـاو. پەرسـیف؛ پەسـیڤ؛ هەلامەت؛ ئالامات 🇮🇷 زُکام
**پەرش** / perş/: ئاوەڵناو. پەرژ؛ پەرت 🇮🇷 پراکندە
**پەرڤۆنە** / pervone/: ناو. پەپوولە 🇮🇷 پروانە
**پەرک** / perk/: ☜ **پەرگ**
**پەرکاڵ** / perkał/: نـاو. جغزینگ؛ ئـامرازی جـەغز کێشان 🇮🇷 پرگار
**پەرکۆ** / perko/: ناو. کاری کوتانی ساواری خڕ تـا تفرەکەی هەڵدا 🇮🇷 عمل کوبیدن بلغـور بـرای جـدا کردن پوستەی آن
**پەرکەم** / perkem/: نـاو. ١. نەزلـە؛ نوزلـە؛ نزلـە؛ ئەنفلۆئەنزا؛ نەخۆشی تـا و هەلامـەت پێکـەوە ٢. فێ؛ خوداری 🇮🇷 ١. آنفلوآنزا ٢. صَرع
**پەرکەما** / perkema/: ☜ **پەرگەما**
**پەرگ** / perg/: ناو. پـەرک؛ سـەرچنی کـلاش 🇮🇷 بافتەی گیوە
**پـەرگر** / pergir/: ئاوەڵـناو. گۆشـەگیر؛ لاتـەریک؛ دوورەپەرێز 🇮🇷 مُنزوی
**پەرگـەما** / pergema/: نـاو. پەرکـەما؛ تـەختی کەنارەی کەلاش 🇮🇷 حاشیەی زیرین گیوە
**پەرگهاندن** / perg(i)handin/: چاوگ. کۆ کردنەوە 🇮🇷 گردآوری کردن
**پەرگهین** / pergihîn/: چـاوگ. کۆ بوونەوە 🇮🇷 گـرد آمدن
**پەرگین** / pergîn/: ناو. گیایەکی کوێسـتانییە، بـۆ ڕەنگی ڕەش کەڵکی لێ وەردەگرن 🇮🇷 گیاهی کـە در رنگرزی برای رنگ سیاه مصرف دارد
**پەرلەمان** / perleman/: ناو. پارلمان؛ ئەنجومـەن؛ کۆڕی نوێنەرانی هەڵبژاردەی خەڵک بـۆ دانـانی قانوون و چاودێری دەوڵەت 🇮🇷 مجلس؛ پارلمان
**پەرلەمانتار** / perlemantar/: ناو. نوێنەر؛ ئەندامی پەرلەمان 🇮🇷 نمایندەی مجلس
**پـەرمان** / perman/: چـاوگ. پەرمـەی؛ پـەرمین؛ ڕابینی؛ ڕابینین؛ ڕاپەرمان؛ ڕاپـەرموون 🇮🇷 اعتمـاد کردن
**پەرموچان** / permûçan/: چـاوگ. سـیس بـوون؛ ژاکان ‹گولام پەرمووچییە› 🇮🇷 پژمُردن
**پەرموون** / permûn/: چـاوگ. ١. پـەرمیان؛ تێـڕا دیتن؛ بڕوا پێکردن ٢. ڕەوینەوە؛ سڵ کـردن 🇮🇷 ١. اعتماد کردن ٢. رَم کردن
**پەرمەی** / permey/: ☜ **پەرمان**
**پەرمیان** / perm(i)yan/: ☜ **پەرموون ـ١**
**پەرمین** / permîn/: ☜ **پەرمان**
**پەرمێشک** / permêşk/: ☜ **پرمێشك**
**پەرنساندن** / pern(i)sandin/: چاوگ. بووژاندنەوە 🇮🇷 احیا کردن
**پەرنسین** / pern(i)sîn/: چـاوگ. بووژانەوە 🇮🇷 احیـا شدن
**پەرننە** / perinne/: ناو. باڵندە؛ پەلەوەر 🇮🇷 پرندە
**پەروا** / perwa/: ناو. باک؛ ترس؛ سڵ 🇮🇷 پروا
**پەروار** / perwar/: ئاوەڵـناو. دابەستە؛ بەختە ‹خـوا گووشت گاپیر خوا شەک پەروار/ گووشت کوتانەکەی بوەیتە دەر حەسار! «شامی»› 🇮🇷 پرواری
**پەروارگە** / perwarge/: نـاو. شـوێنی دابەسـتن و بەخێو کردنی ئاژەڵ بۆ گۆشت 🇮🇷 پرواربندی
**پـەرواری** / perwarî/: ئاوەڵـناو. دابەسـتە؛ بەختـە؛ لەبار بۆ پەروار کردن 🇮🇷 پرواری
**پـەرواز** / perwaz/: نـاو. ١. کـار و ڕەوتی فـڕین؛

باڵ گرتنەوە ٢. زەوار؛ تەختەی باریکی تاشراو بۆ قەراخی سندووق 🇮🇷 ١. پرواز ٢. زَوار

**پەروازبەند** / perwazbend/: ناو. تەختەبەند 🇮🇷 زَواربندی

**پەروانە** / perwane/: ناو. پەپوولە ‹دەرسی عیشقم هەر لە کن پەروانە یا بولبول بووە/ بیگەمێ یا نەیگەمێ هەر مەشقی ئوستادێ دەکەم «مەحوی»› 🇮🇷 پروانه

**پەروە** / perwe/: ناو. پەروو؛ دیاری؛ خەڵات 🇮🇷 سوغات

**ـ پەروەر** / perwer-/: پاشەوشە. بەخێوکەر ‹نیشتمانپەروەر› 🇮🇷 ـ پرور

**پەروەراندن** / perwerandin/: چاوگ. تێپەڕ. //پەروەراندت؛ دەپەروەرێنی؛ بپەروەرێنە// ١. بەخێو کردن ٢. بار هێنان 🇮🇷 ١. مراقبت کردن ٢. پرورش دادن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـــ/ چاوگی نەرێنی: نەپەروەراندن

**پەروەردگار** / perwerdigar/: ناو. ١. ڕاهێنەر ٢. پەروەرندە؛ ئافرێنەر 🇮🇷 ١. پرورش‌دهنده ٢. آفریدگار

**پەروەردن** / perwerdin/: چاوگ. پەروەردەی؛ پەروەراندن 🇮🇷 پروردن

**پەروەردە**[1] / perwerde/: ناو. ١. پەروەرش؛ کار و ڕەوتی بار هێنان ٢. کار و ڕەوتی ڕاهێنان؛ پێگەیاندن ٣. کار و ڕەوتی بار هاتن ٤. وەزارەتی پەروەردە 🇮🇷 ١تا ٣. پرورش ٤. وزارت آموزش و پرورش

⊡ **پەروەردە کردن** بەخێو کردن ‹تۆی پەروەردە کرد بە جوانی/ تۆش سا ببە بە قوربانی «کامران موکری»› 🇮🇷 پروردن

**پەروەردە**[2]: ناوەڵناو. ١. بەخێوکراو ٢. بارهاتوو ‹بۆیە بێ‌شوێن و بێ‌جێم/ پەروەردەی کونجی لادێم «قانع»› ٣. خۆشەکراو ‹زەیتوونی پەروەردە› 🇮🇷 ١تا٣. پرورده

**پەروەردەکراو** / perwerdek(i)raw/: ناوەڵناو. ڕەنێوهاتوو؛ پێ‌گەیەنراو 🇮🇷 تربیت‌شده

**پەروەردەی** / perwerdey/: چاوگ. پەروەردە کردن ‹چمان جە سارای خوتەن چەردەنی/ ئەو زێد ئاوا بۆ تۆش پەروەردەنی «بێسارانی»› 🇮🇷 پروردن

**پەروەردەیی** / perwerdeyî/: ناوەڵناو. ١. پەروەرشی؛ چۆنیەتی بار هێنان ‹کاری پەروەردەیی› ٢. پەروەردە ‹جووچکی پەروەردەیی› 🇮🇷 ١و٢. پرورشی

**پەروەرش** / perweriş/: ناو. پەروەرشت؛ کار و ڕەوتی بەخێو کردن؛ پەروەردە کردن 🇮🇷 پرورش

**پەروەرشت** / perwerişt/: ☜ **پەروەرش**

**پەروەرشی** / perwer(i)şî/: ☜ **پەروەردەیی ـ١**

**پەروەرشیار** / perwerişyar/: ناو. ڕاهێن؛ ڕاهێنەر؛ فێرکەر 🇮🇷 مُربی

**پەروەرنای** / perwernay/: چاوگ. پەروەردە کردن 🇮🇷 پروردن

**پەروەرندە** / perwerinde/: پەروەردگار؛ ئافرێنەر ‹جا ئەوانەی بەباوەڕن، ڕوون دەزانن ئەمە ڕاستە و لە پەروەرندەیانڕایە «هەژار، *قورئان*»› 🇮🇷 آفریدگار

• **پەروەری** / perwerî-/: پاشەوشە. ١. بەخێوکەری ‹هەتیوپەروەری› ٢. خزمەتکاری ‹نیشتمانپەروەری› 🇮🇷 ١. پرورندگی ٢. خادمی

**پەروەریای** / perweryay/: چاوگ. پەروەردە بوون 🇮🇷 پرورده شدن

**پەروەرێن** / perwerên/: ناو. پەروەردگار؛ پەروەرندە ‹ئەو کەسانەی سوور دەزانن تووشی پەروەرێنیان دەبن و دەگەڕێنەوە بۆ لای خۆی «هەژار، *قورئان*»› 🇮🇷 پروردگار

**پەروەندان** / perwendan/: ناو. زونکەن 🇮🇷 زُنکن

**پەروەندە** / perwende/: ناو. دۆسیە؛ هەڤنڤیس؛

کۆمەڵی زانیاری و بەڵگە و نووسراوە لە بارەی کەسێ یان ڕووداوێکەوە ☰ پرونده

**پەروین / perwîn/**: ناو. پێروو؛ کۆ؛ پیرۆ؛ ئەستێرەی کۆ ☰ ستارەی پروین

**پەرۆش[1] / peroş/**: ناو. خەم؛ خەفەت؛ داخی دڵ ☰ غم؛ اندوه

**پەرۆش[2]**: ئاوەڵناو. پەشێو؛ دڵخورت؛ دڵپەرێشان ☰ نگران

**پەرۆشی / peroşî/**: ناو. پەشێوی؛ دڵپەرێشانی ☰ نگرانی

**پەرو / perû/**: ☜ پەروە

**پەرە[1] / pere/**: ناو. ١. پوول؛ دراو؛ پارە ٢. برەو؛ ڕەواج ٣. کاری بەربلاو کردنەوە ☰ ١. پول ٢. رواج؛ گسترش ٣. عمل گسترش دادن

◙ **پەرە پێ دان** ١. برەو پێ دان ٢. بەربلاو کردنەوە؛ پان‌وبەرین کردنەوە ٣. گەشە پێ دان؛ پێ زیاد کردن ☰ ١. رواج دادن ٢. گسترش دادن ٣. ترقی دادن

**پەرە سەندن** ١. وە ڕەواج کەوتن؛ لە برەودا بوون ٢. بەربلاو بوونەوە ٣. گەشە کردن ٤. لە زێدە بوون ☰ ١. رواج یافتن ٢. گسترده شُدن ٣. رشد کردن ٤. ترقی کردن

**پەرە گرتن** لە زیادی بوون ☰ رواج یافتن

**پەرە[2]**: ئامراز. لە بەر ☰ برای

**پەرەپەلیک / perepelîk/**: ☜ پەڵپینە

**پەرەپیلیک / perepîlîk/**: ☜ پەڵپینە

**پەرەخاندن / perexandin/**: چاوگ. هەڵگلۆفین؛ گلۆفین و چرچ کردن ☰ مُچاله کردن

**پەرەزیلە / perezîle/**: ناو. مێوینەی گیا؛ پایەی سەر لینج و نەرم لە ناو گوڵی گیادا کە دەبێتە هۆی بەر هێنانی گیا و ئاوس بوونی ☰ کُلاله

• **پەرەس / peres/**: ☜ ـ پەرس

• **پەرەست / perest/**: ☜ ـ پەرس

**پەرەستار / perestar/**: ☜ پەرستار

**پەرەستاری / perestarî/**: ☜ پەرستاری

**پەرەستگا / perestga/**: ☜ پەرەستگە

**پەرەستگە / perestge/**: ناو. پەرەستگا؛ شوێنی دوعا و نزا ☰ پرستشگاه

**پەرەستو / perestû/**: ناو. پەڕەسێلکە ☰ پرستو

**پەرەسە / perese/**: ناو. جێگە و پێگە؛ پلە و پایە ☰ مقام و موقعیت

**پەرەسەندو / peresendû/**: ئاوەڵناو. ڕوو لە زیادی ناو ☰ رواج یافته

**پەرەسین / peresîn/**: ☜ پەرستن

**پەرەسێن / peresên/**: ئاوەڵناو. ڕوو لە زیادی ☰ در حال رشد

**پەرەک / perek/**: ناو. سوهەیل؛ گەلاوێژ ☰ ستارەی سُهیل

**پەرەکە / pereke/**: ناو. پەراسوو؛ پەراسی؛ پارخان (زۆرتر بۆ هی حەیوان دەگوترێ) ☰ دنده

**پەرەلێل / perelêl/**: ئاوەڵناو. هاوشان؛ تەریب ☰ موازی

**پەرەندا / perenda/**: ناو. پۆلا؛ پۆلاد؛ کارۆک ☰ فولاد

**پەرەنشک / perenşik/**: ☜ پرمێشک

**پەرەنگ / pereng/**: ناو. ١. پەنگر؛ پەنگڵ؛ پەنگ؛ پۆلوو؛ پۆل ‹لە گوارەی پر پەرەنگ دڵ پر پەرەنگم/ چەماوی بەژن و بالای شۆخ و شەنگم «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ٢. لەرزانەی گوارە ☰ ١. اخگر ٢. آویزەی گوشواره

**پەرەوکێ / perewkê/**: ☜ پەوکەی

**پەرەوێرار / perewêrar/**: ☜ پەسرپێرارەکە

**پەرەوێرارەنە / perewêrarene/**: ☜ پەسرپێرارەکە

**پەرەوێرارەوە / perewêrarewe/**: ☜ پەسرپێرارەکە

**پەرهێز / perhêz/**: ☜ پارێز[1]

**پەرهێش / perhêş/**: ☜ پەرێش

**پەرهێن / perhên/:** ☜ **پەرجۆ**

**پەری / perî/:** ناو. ١. *[باوەڕی کۆن]* فریشتە؛ فرشته؛ جوانی باڵداری خەیاڵی ٢. جوانی بێوێنە (بۆ کچ و ژن) ٣. پەردووی بووک و زاوا ☰ ١. فرشته ٢. پَری ٣. حجله

**پەریبڕ / perîbiř/:** ناو. منداڵێ کە خەتەنە کردنی ناوێ ☰ کودک بی‌نیاز به ختنه

**پەریڕوخسار / perîřuxsar/:** ☜ **پەریڕو**

**پەریڕو / perîřû/:** ئاوەڵناو. پەریڕوخسار؛ زۆر زۆر جوان ☰ پریرو

**پەریز / perîz/:** ☜ **پەیژە**

**پەریزاد / perîzad/:** ناو. پەریزادە: ١. منداڵی پەری ٢. جوانچاکی مێوینە ☰ ١. پریزاد ٢. پریزاده

**پەریزادە / perîzade/:** ☜ **پەریزاد**

**پەریشاخ / perîşax/:** ناو. پەڕەسێلکە ☰ پرستو

**پەریشارۆخ / perîşarox/:** ناو. زەردەزێڕە؛ مەلێکی سینگ زەردی باڵ ڕەشە ☰ زردەپرەی مزرعه

**پەریشان / perîşan/:** ئاوەڵناو. پەشێو؛ بێسەروبەر ☰ پریشان

**پەریوەشان / perîweşan/:** ناو. گوڵێکی بۆنخۆشە ☰ پرسیاوشان

**پەریهتن / perîhtin/:** چاوگ. تولانەوە؛ داتولان؛ لە بەر یەک چوونی گۆشت، بە هۆی زۆر کوڵانەوە ☰ له شدن گوشت بر اثر زیاد پختن

**پەرێز[1] / perêz/:** ناو. ١. جاڕ؛ جێگەی دەغڵی دروراو ٢. بە دزە و پارێزەوە بۆ نێچیر چوون ٣. بۆسەی ڕاوچی ☰ ١. جای غلەی درویده ٢. به سوی شکار خزیدن ٣. کمین شکارچی

• **پەرێز[2]:** پاشەوشە. ـ پارێز؛ ئەوەی کاری پاراستنە ‹دوورەپەرێز› ☰ ـ پای

**پەرێژ / perêj/:** ناو. کار و ڕەوتی پەرژان ☰ عمل پرداختن به کار

**پەرێش / perêş/:** ناو. پەرهێش؛ پاکانە؛ پێپاکی ☰ تبرئه

**پەرێشان / perêşan/:** ئاوەڵناو. ١. پەخش؛ پرژ؛ بڵاو ‹ئەی عەجەب گریام وەکوو هەوری بەهاران و کەچی/ پێکەنینی ئەو گوڵەی کاکۆڵ پەرێشانم نەهات «وەفایی»› ٢. پەشێو؛ خەمگین؛ دڵبەخەم ‹سیابەختی لە مەجنوونی مـن ئیتر چی دەوێ مەحوی/ سەرم شێواوە، ڕۆژم تیرەیە، حاڵم پەرێشانە «مەحوی»› ٣. سەرسام؛ حەپەساو؛ سەرلێشێواو ‹دڵ موزمەحیلی دەردە وەکوو دیدە لە نمدا/ حەیران و پەرێشانە وەکوو قەترە لە یەمدا «نالی»› ☰ ١. پراکنده ٢. پریشان ٣. سرگشته

**پەرێشانحاڵ / perêşanĥal/:** ئاوەڵناو. کەلەلا؛ حاڵشڕ ☰ پریشان‌احوال

**پەرێشانی / perêşanî/:** ناو. ١. شپرزی؛ شێواوی ‹خاترێکی شۆخ و خۆش و بێغەم و جەمعم هەبوو/ ئێستە بۆ زوڵفی کەسێ مەشقی پەرێشانی دەکا «نالی»› ٢. خەم و خەفەت؛ نیگەرانی ‹پەرێشانی دڵ و جەمعی ڕەقیبە/ لە سەودای زوڵفی تۆ سوود و زیانم «حاجی قادر»› ٣. *[دروونناسی]* دڵخورتی؛ دڵەڕاوکێ ☰ ١. آشفتگی ٢. پریشانی ٣. اضطراب

**پەڕ[1] / peř/:** ناو. ١. لەشداپۆشی مەل ‹شلکی، ناسکی، نەتداوە بای باڵ/ دەرت نەکردووە پەڕ و خەت و خاڵ «مەلا ئاوارە»› ٢. قەراخ؛ کەنار ‹ئەم پەڕ و ئەو پەڕ› ٣. وەرەقە کاغەز ‹چەند پەڕی کتێبەکە دڕاوە› ٤. کار و ڕەوتی فڕین ٥. کار و ڕەوتی پەڕین؛ باز بردن ☰ ١. پَر ٢. کنار ٣. ورق کاغذ ۴. پرواز ۵. پرش

⊡ **پەڕ دەرکردن:** *[مەجاز]* لەو پەڕی تامەزرۆییدا بوون ‹سلاوت لێ دەکەم، جوابم دەوە، هەر وەختە پەڕ دەرکەم/ تکاشت لێدەکەم، تۆزێ نەوازش، دڵ هەراسانە «ئاوات»› ☰ در نهایت اشتیاق بودن

**پەڕ[2]:** ئاوەڵناو. ١. ئاخر؛ دوماهی ٢. لێ دڕاو ٣.

دوور ٤. سپی سەر و مل ڕەش (مەڕ) ☰ ١. پسین ٢. زده شده ٣. دور ۴. سفید سر و گردن سیاه (گوسفند)
◻ **پەڕ بوون**: ١. دوور کەوتنەوە ٢. بە خەتا چوون ☰ ١. دور افتادن ٢. اشتباه کردن
**پەڕ هەڵخستن**: بڵاو بوونەوەی مەڕ و ماڵات بە کێودا بۆ لەوەڕین ☰ پخش شدن گوسفندان برای چرا
- **پەڕ**[٢]: پاشەوشە. ١. پەڕان؛ کەوتوو ‹زەردەپەڕ؛ ڕۆژپەڕ› ٢. باز ‹دەسپەڕ› ٣. تێپەڕ ‹تیژپەڕ› ٤. ـفڕ ‹نزمپەڕ› ٥. ـ پەڕیو؛ ـ نەماو ‹لێوپەڕ› ☰ ١. گذر ٢. ـجُنبان ٣. ـ گذر؛ ـ جنب ۴. پرواز ۵. ـ زده
**پەڕاشۆتڤان** / peřaşotvan/: ناو. چەترباز؛ ئەوەی بە چەتر لە فڕۆکەوە دادەپەڕێ ☰ چترباز
**پەڕامێز** / peřamêz/: ☜ **پریمووس**
**پەڕان** / peřan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //پەڕایت؛ دەپەڕی؛ بپەڕە// ١. سوار بوونی نێر لە مێ ٢. لەت لێ بوونەوە ٣. پەرت بوون ☰ ١. قرار گرفتن نر بر ماده ٢. لب‌پر شدن ٣. پرت شدن
■ ناوەڵناوی بەرکاری: پەڕاو/ چاوگی نەرێنی: نەپەڕان
**پەڕانپەڕ** / peřanpeř/: ناوەڵکار. ١. دەورانـدەور؛ کەنارەوکەنار ٢. سەرانسەر؛ سەرتاسەر ☰ ١. پیرامون ٢. سرتاسر
**پەڕاندن** / peřandin/: چاوگ. تێپەڕ. //پەڕانـدت؛ دەپەڕێنی؛ بپەڕێنە// پەڕانن: ١. سوار کردنی نێر لە مێوینە ٢. لەت لێ فڕێدان ‹ئەم لکە بپەڕێنە› ٣. بەجێ هێشتن ‹لە خوێندنەوەدا خەتێکت پەڕاند› ٤. لە پێش لابردنی کۆسپ ‹لەمپەرم پەڕاند› ٥. لێدوور کردنەوە ‹خەو پەڕاندن› ☰ ١. سوار کردن نر بر ماده ٢. جدا کردن جزئی از کل ٣. جا گذاشتن ۴. برداشتن مانع ۵. پراندن؛ دور کردن
■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپەڕاندن
**پەڕاندنەوە** / peřand(i)newe/: چاوگ. پەڕاننەوە: ١. لە ئاو دەرباز کردن ٢. *[مەجاز]* لە بەلا ڕزگار کردن ☰ ١. عبور دادن از آب ٢. نجات دادن
**پەڕانن** / peřanin/: ☜ **پەڕاندن**
**پەڕاننەوە** / peřannewe/: ☜ **پەڕاندنەوە**
**پەڕانەوە** / peřanewe/: چاوگ. تێنەپەڕ. //پەڕایەوە؛ دەپەڕێیەوە؛ بپەڕێوە// پەڕینەوە؛ لە ئاو، پرد و... دەرباز بوون ☰ عبور کردن
■ ناوەڵناوی بەرکاری: پەڕاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەپەڕانەوە
**پەڕاو**[١] / peřaw/: ناو. پەڕاوی: ١. کتێب؛ پەرتووک ‹کێ لە شاری تۆ، لە شاری قاتڵی هەژار/ گوێ ئەداتە ئایەتی پەڕاوی دڵ؟ «سوارە»› ٢. دەفتەر ٣. دەفتەری پەڕە سیگار ٤. قەراخی زەریا ☰ ١. کتاب ٢. دفتر ٣. بستەی کاغذ سیگار ۴. ساحل دریا
- **پەڕاو**[٢]: پاشەوشە. ــ پەڕیو؛ لاچوو؛ دوورکەوتوو ‹خەوپەڕاو› ☰ پریده؛ دور شده
**پەڕاوی** / peřawî/: ☜ **پەڕاو**[١]
**پەڕاوێز** / peřawêz/: ناو. ١. ☜ **پەراوێز** ٢. پەردوو؛ هەلاشی بان ☰ ١. ☜ **پەراوێز** ٢. پوده
◻ **پەڕاوێزی ئاسمان**: ئاسۆ ☰ اُفق
**پەڕبەسەر** / peřbeser/: ناوەڵناو. ناسراو؛ بەناوبانگ؛ ناوبەدەرەوە ☰ مشهور
**پەڕبەڵەکە** / peřbełeke/: ناو. باڵ‌بەڵەکە؛ قجی؛ چۆلەکەگرە؛ سەقری مێشخۆر؛ باڵندەیەکە لە بنەمای چۆلەکان بە لاق و چنگی بەهێزەوە کە لە بەرزاییەوە خۆی بۆ نێچیر مەلاس دەدا، چەن جۆری هەیە ☰ سنگ‌چشم
**پەڕپتین** / peřp(i)tîn/: چاوگ. بڵاو بوون؛ لە بەر یەک چوون ☰ وا رفتن
**پەڕپووت**[١] / peřpût/: ناو. جۆرێ مراوی ☰ نوعی مرغابی
**پەڕپووت**[٢]: ناوەڵناو. لێکهەڵوەشاو؛ لێکبڵاو

‹قیافەی پەڕپووت وەک کتێبی کۆن/ زمانی شیرین سیمای نەختێ مۆن «گۆران»› 🇮🇷 وارفته

**پەڕ ـ پەڕ / peř peř/**: ئاوەڵناو. ١. لە بەر یەک هەڵوەشاو؛ پرژ و بڵاو ‹کتێبەکەم پەڕ ـ پەڕ بووەوە› ٢. *[کیایە]* فەوتاو؛ مردوو 🇮🇷 ١. پرـ پر؛ ورق ـ ورق ٢. نیست و نابود

**پەڕپەڕک / peřpeřik/**: ناو. پەڕپەڕەک: ١. پەپوولە ٢. گوڵی لیلووپەڕ 🇮🇷 ١. پروانه ٢. نیلوفر

**پەڕپەڕۆچکە / peřpeřoçke/**: ناو. تەشق؛ حەوێق؛ بەرزایی ئاسمان 🇮🇷 اوج

**پەڕپەڕۆک / peřpeřok/**: ناو. پەپوولە 🇮🇷 پروانه

**پەڕپەڕەک / peřpeřek/**: ☜ **پەڕپەڕك**

**پەڕپەژمینە / peřpejmîne/**: ناو. ئیسکاج 🇮🇷 اسکاچ

**پەڕپینە / peřpîne/**: ناو. پەڵپینە؛ پرپرە 🇮🇷 گیاه خُرفه

**پەڕتان / peřtan/**: چاوگ. هەڵپچڕان 🇮🇷 پاره ـ پاره شدن

**پەڕتاندن / peřtandin/**: چاوگ. لە بەر یەک هەڵپچڕاندن 🇮🇷 پاره ـ پاره کردن

**پەڕتاوتن / peřtawtin/**: ☜ **پەرتاوتن**

**پەڕتوک / peřtûk/**: ☜ **پەرتوك**

**پەڕتەوازە / peřtewaze/**: ئاوەڵناو. پەرەوازە؛ وەیلان؛ ئاوارە 🇮🇷 آواره

**پەڕتین / peřtîn/**: چاوگ. پەڕتان؛ تێکوپێک چوون و پچڕ ـ پچڕ بوون 🇮🇷 لت‌وپار شدن

**پەڕداڵ / peřdał/**: ناو. پەڕەی ژێری تیر 🇮🇷 پرّەی ناوک تیر

**پەڕڕە / peřře/**: ناو. هەلاجی 🇮🇷 پنبه‌زنی

**پەڕژ / peřj/**: ئاوەڵناو. پرژ؛ بڵاو 🇮🇷 پراکنده

**پەڕژان / peřjan/**: چاوگ. چۆڕپریان؛ بڵاو بوون 🇮🇷 پراکنده شدن

**پەڕسێلک / peřsêlik/**: ☜ **پەرەسێلکە**

**پەڕش / peřiş/**: ☜ **پەڕشت ـ١**

**پەڕش[1] / peřş/**: ناو. بروێش ‹سەد سۆفی هەیە پشت‌پان، مل‌فیلە/ بەوان گێرە کا پەڕش و دێمیلە «هەژار، بۆ کوردستان»› 🇮🇷 از حبوبات

**پەڕش[2]**: ئاوەڵناو. پەرژ؛ پرژ؛ بڵاو 🇮🇷 پراکنده

**پەڕشت / peřişt/**: ناو. ١. پەڕشتە؛ پەڕشە؛ پەڕش؛ دەغڵێکە لە جۆ ئەکا کرەی ئەکەن ناوکەکەی وەک برنج دە کار دێنن ٢. ڕۆجیارپەڕشت؛ گوڵەبەڕۆژە ٣. توو؛ تۆم ٤. باز 🇮🇷 ١. از حبوبات ٢. گل آفتابگردان ٣. تخمەی آفتابگردان ۴. پرش

**پەڕشتە / peřişte/**: ☜ **پەڕشت ـ١**

**پەڕشتی / peřiştî/**: ئاوەڵناو. بازدەر ‹موتوری پەڕشتی› 🇮🇷 جَهنده

**پەڕشخۆرکە / peřşxorke/**: ناو. پەڕشەخۆرە؛ پەڕش‌خۆرە؛ سیچرە؛ مەلێکی بۆری چکۆلەیە بە قەد چۆلەکەیەک دەبێ 🇮🇷 از پرندگان

**پەڕشخۆرە / peřşxore/**: ☜ **پەڕش‌خۆرکە**

**پەڕشکە / peřşke/**: ناو. چێشتێک لە ماش، نۆک، پاقلە، بروێش، هەڕشتە و بیبار کە وەک شلە لێی‌دەنێن و بۆ هەلامەت باشە 🇮🇷 آش بلغور

**پەڕشە / peřşe/**: ناو. ١. ☜ **پەڕشت ـ١** ٢. کا و کۆتی دانەوێڵە 🇮🇷 ١. ☜ **پەڕشت ـ١** ٢. آنچه کە از غله بیخته و دور می‌ریزند

**پەڕشەخۆرە / peřşexore/**: ☜ **پەڕش‌خۆرکە**

**پەڕک / peřik/**: ناو. ١. پەڕەمەلی چکۆلە ٢. پەڕی کاغەزە سیگار 🇮🇷 ١. پر کوچک ٢. کاغذ سیگار

**پەڕکاڵ[1] / peřkał/**: ناو. خرت‌وپرتی ناوماڵ 🇮🇷 خرت‌وپرت

**پەڕکاڵ[2]**: ئاوەڵناو. لێک‌ولەبار؛ پەرداخ 🇮🇷 ساخته و پرداخته

**پەڕکوڵۆڵ / peřkułoł/**: ئاوەڵناو. سەر و چاو ڕەشی قەپۆز سپی (مەڕ) 🇮🇷 سر و گردن سیاهِ پوزه سفید (گوسفند)

**پەڕکوڕ / peřkûř/**: ناو. جۆرێک هەڵۆی

کوێستانی بە درێژایی ٨٨ سانتیمیتر کە مەودای نێـوان دوو باڵــی تـا ٢٣٠ سـانتیمیتـر دەگـات، ڕەنگی قاوەیی تۆخی ڕەشباوە لە دەوری سـەر و پشت ملی، پەڕی زێڕین دەبینـرێ ☰ عقـاب سـر طلایی

**پەڕگار / peřgar/**: نـاو. پـەرگاڵ؛ جـەغزینگ ☰ پرگار

**پەڕگاڵ / peřgał/**: ☜ **پەڕگار**

**پەڕگەنە / peřgene/**: ئاوەڵناو. شپرزە؛ پـرژ و بـڵاو ☰ پراکندە

**پەڕلەپێ / peřlepê/**: ناو. پەڕەپا؛ چەشـنێ کـۆتر کە لاقی تا خوار پەڕی پێوەیە ☰ نوعی کبوتر

**پەڕندە / peřinde/**: ناو. باڵـندە؛ فـڕۆک؛ پەڕنـە؛ فڕندە؛ مەل ☰ پرندە

**پەڕننە / peřinne/**: ☜ **پەڕندە**

▪ **پەڕنە / peřne/**: پاشەوشـە. ـ لابەر؛ لەناوبەر ‹بـای سیپەڕنە› ☰ از بین برندە

**پەڕنیان / peřn(i)yan/**: نـاو. حـەریر؛ جـۆرێ قوماش لە ئاوریشمی نەرم ☰ پرنیان

**پەڕوپۆ / peř û po/**: ناو. کۆنک؛ تووکی باڵـدار ☰ پر پرندە

**پەڕوشک / peřuşk/**: ناو. پریشـکی تـراو؛ پرشـەی شتی ئاوەکی ☰ پشنگ

**پەڕوەکۆنە / peř(i)wekone/**: ناو. گـریش؛ تیتـۆڵ ☰ کُهنە

**پەڕۆ / peřo/**: ناو. پەڕوو؛ پارچە قوماشی کـۆن ☰ پارچەی کهنە

⊡ **پەڕۆ کردن**: *[مـجاز]* پینـە کـردن؛ چـار کـردن ‹هەی داد هەی بێداد هـەی ڕۆ ڕۆڵـە ڕۆ/ بـرینی جەرگم قەت ناکرێ پەڕۆ «هێمن»› ☰ وصلە زدن

**پەڕۆ لە حاڵی کەسێ دادڕین**: *[مـجاز]* خـۆ نانـە جێی کەسێ ‹خـوا هەڵـناگرێ پەڕۆیـەکیش لـە حاڵی دز دادڕین› ☰ خود را جای کسی گذاشتن

**پەڕۆشان / peřoşan/**: ناو. دەسرۆکەی سەرشـانی منداڵ، بـۆ دەم و لـووت سـڕین ☰ دسـتمال روی شانەی کودک

**پەڕۆک / peřok/**: ناو. ١. باڵـندە؛ مـەل ‹دەمهاتنـە سایەم نازێ و نازەنین/ لە سـەرم دەنیشـت پـەڕۆکی باڵشین «؟»› ٢. پاتک؛ پینە ☰ ١. پرندە ٢. وصلە

**پەڕۆکۆن / peřokon/**: ناو. کنجر؛ کنجـک؛ بزگـوڕ ☰ کُهنەپارە

**پەڕۆگـو / peřogû/**: نـاو. *[شـووڕەیی]* ١. کۆنـەی منال؛ پەڕۆی ناو شوالی منداڵ ٢. *[کێنایە]* مـرۆی پەست و ناکەس ☰ ١. کهنەی بچە ٢. آدم پسـت و پلشت

**پەڕۆ و پاڵ / peřowpał/**: ناو. لەتە پارچە ☰ تکە پارچە

**پەڕوو / peřû/**: ☜ **پەڕۆ**

**پەڕووش / peřûş/**: ناو. پەڕووشە؛ چیلکـە و چـاڵ؛ خشت و خاڵ ☰ پوشال؛ خاشاک

**پەڕووشە / peřûşe/**: ☜ **پەڕووش**

**پەڕووک / peřûk/**: ناو. کووتاڵ؛ قوماش؛ پارچـە ☰ پارچە

**پەڕە / peře/**: نـاو. ١. پـەڕەی تـۆپی ئاسـیاو ٢. کاری هەلاج ٣. پەڕە سیگار ٤. بەڵگ؛ وەرەق ‹با لە ناو پەڕەی مێژوو بمێنێ/ کورد تۆڵەی خـوێنی بـە خوێن ئەسێنێ «قانع»› ٥. پەلک؛ بەرگی گـوڵ ☰ ١. پرّەی آسیاب ٢. پنبەزنی ٣. کاغذ سیگار ۴. ورق ۵. برگ گُل

⊡ **پەڕە کردن**: شی کردنـەوە؛ هـەلاجی کـردن ☰ حلاجی کردن

**پەڕەپا / peřepa/**: ☜ **پەڕلەپێ**

**پەڕەخەڕەک / peřexeřek/**: ناو. ئامرازی خـەرەکی پەمۆڕێسی ☰ ابزاری در دوک

**پەڕەژاڵ / peřejał/**: ناو. ناوی گوڵـێکە ☰ از گُل‌ها

**پەڕەستن / peřestin/**: ☜ **پەڕستران**

**پەڕەسلێرکە / peřes(i)lêrke/:** ☜ **پەڕەسێلکە**

**پەڕەسلێنکە / peřes(i)lênke/:** ☜ **پەڕەسێلکە**

**پەڕەسوێلکە / peřes(i)wêlke/:** ☜ **پەڕەسێلکە**

**پەڕەسیسە / peřesîse/:** ☜ **پەڕەسێلکە**

**پەڕەسێلکە / peřesêlke/:** ☜ **پەڕەسێلکە**

**پەڕەسێرکە / peřesêrke/:** ☜ **پەڕەسێلکە**

**پەڕەسـێلکە / peřesîlke/:** نـاو. پەڕەسـیلکە؛ پەڕەسـلێرکە؛ پەڕەسـلێنکە؛ پەڕەسـوێلکە؛ پڕسێلکە؛ پڕەسـێلکە؛ پەڕسـێلک؛ پەڕەسـێولکە؛ پەڕەسـێرکە؛ پەڕەسیسـە؛ پلیسـر؛ پلیسـرک؛ پلیرسگ؛ پلیسە؛ پلیسری؛ پولیسـور؛ پلووسـگرد؛ پلیـزرک؛ پلیـزرگ؛ پریزگـرد؛ پزلگـرد؛ پلوسـگر؛ مەقسـوک؛ حـاجیڕەش؛ حـاجیڕەشـک؛ حـاجیڕەنـگ؛ حـاجیحاجـک؛ هەجـەجک؛ هەچهـەجک؛ سیپریسـک؛ سیپەپرووسـنەک؛ سیاپورسـینک؛ سێپرووسـنەک؛ پروسـنەک؛ سیاپوسـینگ؛ پلـیزر؛ پلیزگـردی؛ پلـۆزگردی؛ کاردەپەلـە؛ زەڕزوور؛ دوومقـەس؛ مقەسـۆک؛ دومقەسـەک؛ میقەسـووک؛ دومقەسـوک؛ دومەقەسەک؛ دەوارکەلـگ؛ دیـدم؛ دەوارەکـەل؛ باڵداری کۆچەری لـە چۆلەکـە گـەورەتر کـە بـە کۆمەڵ دەفڕن ⩩ پرستو

**پەڕەسێولکە / peřesêwilke/:** ☜ **پەڕەسێلکە**

**پەڕەشووت / peřeşût/:** ☜ **پاراشووت**

**پـەڕەک / peřek/:** ئاوەڵـناو. هـۆکی؛ فـارزک؛ زۆر گانکەر ⩩ شهوتران

**پەڕەکاغەز / peřekağez/:** ناو. وەرەقـە؛ وەرەق ⩩ ورق کاغذ

**پەڕەکانزا / peřekanza/:** ناو. وەرەق؛ کانزای وەک کاغەز پانەوە کراو ⩩ ورق فلزی

**پەڕەکـەر / peřeker/:** نـاو. هـەلاج؛ ڤەبسـکوڕ ⩩ پنبەزن؛ حلاج

**پەڕەمریشکە / peřem(i)rîşke/:** ناو. سیچقە؛ تـەز؛ مووچرک؛ حاڵەتی مووی لەش ڕاست بوونەوە لـە سەرما، خۆشی و ... ⩩ حالت سیخ شدن مو

**پەڕەملە / peřem(i)le/:** نـاو. ملوانـک؛ ملوانکـە ⩩ گردنبند

**پەڕەمووچ / peřemûç/:** ناو. پەڕەمووچـە؛ فڵـچەی چکۆلەی وێنە کێشان ⩩ قلم‌مو

**پەڕەمووچە / peřemûçe/:** ☜ **پەڕەمووچ**

**پەڕەمەساسە / peřemesase/:** ناو. تەیر؛ چەورۆکە؛ تەڕنەبابیلە ⩩ بادخورَک

**پەڕەناو / peřenaw/:** ↓

⊡ **پەڕەناو کردن:** هەڵگێڕاندنەوەی ئاڵف و کڵۆشی بەرپای گاگێرە بۆ باش ورد بـوونی ⩩ زیـر و رو کردن خرمن

**پـەڕەوازە / peřewaze/:** ئاوەڵـناو. دەرکەوتـە ‹لـە دووری بـالات بـووم پـەڕەوازە/ خـەمبارت کـردم زۆر بێ‌ئەندازە «فولکلۆر»› ⩩ دربەدر

⊡ **پەڕەوازە بـوون:** باڵـەوازە بـوون: ١. فێـری بـاڵ گرتنەوە بوونی بێچووی مـەل ٢. *[مـەجاز]* دوور کەوتنـەوەی کـوڕ و کـچ لـە ماڵـی بـاوک و گیرسانەوە لە شـوێنی تـر ⩩ ١. پـرواز آمـوختن جوجەی پرندە ٢. مُستقل شدن فرزندان

**پـەڕەوڵ / peřewil/:** ناو. باڵندە؛ پەلەوەر؛ مـەل ⩩ پرندە

**پەڕهەنگ / peřheng/:** ☜ **پڕهەنگ**

**پەڕیتان / peřîtan/:** چاوگ. پەڕیتاندن؛ ئاوەڕووت کردن؛ پەڕ ڕووتانـەوە؛ قوشـقن کـردن ⩩ آبـروت کردن

**پەڕیتاندن / peřîtandin/:** ☜ **پەڕیتان**

**پەڕیتانک / peřîtanik/:** ناو. پەڕپەڕۆک ⩩ پروانە

**پەڕین / peřîn/:** چاوگ. تێنەپەڕ. //پەڕیت؛ دەپـەڕی؛ بپـەڕە// ١. هەڵـدێران؛ هەڵـەوگەڕیان ٢. سـوار بوونی نێر لە مێ ٣. فڕین؛ لەرزینی پـەڵکی چـاو ٤. شکانی سووچێکی شتی تورت ٥. باز بـردن و

خۆهەڵدان ٦. سڕ بوون لە سەرما 🇮🇷 ١. واژگون شدن ٢. قرار گرفتن نر بر مادە ٣. پریدن پلک چشم ۴. لبپر شدن ۵. جهیدن ۶. بیحس شدن از سرما
■ ئاوەڵناوی بەرکاری: پەڕیو/ چاوگی نەرێنی: نەپەڕین

**پەڕینەوە** / peřînewe/: چاوگ. تینەپەر. //پەڕیتەوە؛ دەپەڕیتەوە؛ بپەڕێوە// ١. لە ئاو یان لە شەقام چوونە ئەو بەر ‹لە پردی نامەرد قەت مەپەڕەوە/ جەردە رووتت کا با لەو بەرەوە «پیرەمێرد»› ٢. [کینایە] دەرباز بوون ‹لە سەربازی پەڕییەوە› 🇮🇷 ١. از عرض گذشتن ٢. خلاص شدن
■ ئاوەڵناوی بەرکاری: پەڕیوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەپەڕینەوە

**- پەڕیو** / peřîw-/: پاشەوشە. ـ پەڕاو؛ لاچوو ‹خەوپەڕیو؛ لاقپەڕیو› 🇮🇷 پریدە

**پەڕیوە** / peřîwe/: ئاوەڵناو. دەربەدەر؛ ئاوارە ‹بوومە ئاوارە و پەڕیوەی دوورولات/ کەوتمە نێو وردەداوی ڕێی نەجات «هێمن»› 🇮🇷 آوارە

**پەڕیوی** / peřîwî/: ناو. کەتایی؛ کەلایی؛ کەوتوویی 🇮🇷 لبشکستگی

**- پەڕێن** / peřên-/: پاوشەوشە. ١. ـ قرتێن؛ ـجیاوەکەر ‹لاقپەڕێن› ٢. ـ لابەر ‹دەغەزپەڕێن› ٣. ـ لێدوورخەر ‹خەوپەڕێن› 🇮🇷 ١و ٢. ـ بُر ٣. ـشکن

**• پەڕێنی** / peřênî-/: پاوشەوشە. ١. جیاوەکەری ٢. لابەری ٣. لێدوورخەری 🇮🇷 ١. قطع کنی ٢. حذف کنی ٣. دفع کنی

**پەز**[١] / pez/: ناو. پەس: ١. مەڕ؛ مێ ‹بەهار پەز، هاوین جەز، پاییز ڕەز، زستان ئەز «مەسەل»› ٢. [مەجاز] مێگەل لە مەڕ و بزن 🇮🇷 ١. گوسفند ٢. گلە

**پەز**[٢]: دەنگ. وشەی لێخوڕینی گا کاتی جووت 🇮🇷 کلمەی راندن گاو هنگام شخم زدن

**پەز**[٣]: پێشوشە. پەس-: ١. وە؛ باز ‹پەزاو› ٢. پاش ‹پەزمەندە› 🇮🇷 ١. باز ٢. پس ـ

**• پەز**[٤]: پاشەوشە. ـ لێنەر ‹چاپەز› 🇮🇷 ـ پَز

**پەزاج** / pezac/: ناو. پەژاج: ١. مامان ٢. ژنی یاریدەدەری مامان لە کاتی منداڵ بووندا 🇮🇷 ١. ماما ٢. دستیار ماما

**پەزاڤ** / pezav/: ناو. پەزاو؛ دووئاو؛ ئاودێری سەوزەوات بۆ جاری دووهەم 🇮🇷 آبیاریِ دوم

**پەزان**[١] / pezan/: ☜ بەزان

**• پەزان**[٢]: پاشەوشە. کولان ‹هەڵواپەزان؛ خورماپەزان› 🇮🇷 ـ پزان

**پەزاندن** / pezandin/: ☜ بەزاندن

**پەزانن** / pezanin/: چاوگ. لێنان 🇮🇷 پُختن

**پەزاو** / pezaw/: ☜ پەزاڤ

**پەزپەزەکێفی** / pezpezekêfî/: ناو. پەسپەسەکێوی؛ پەسپەسەکۆڵە؛ جاڵجاڵووکەیەکی کوڵکنی بێئازارە 🇮🇷 نوعی عنکبوت

**پەزدی** / pezdî/: ناو. پێشکە؛ مێشوولە؛ تۆفانە؛ پەخشە 🇮🇷 پشە

**پەزشکە** / pezişke/: ☜ پرمێشك

**پەزکدانک** / pezikdanik/: ناو. هاوڵەی جەرگی ئاژەڵ 🇮🇷 بیماری کبد دام

**پەزکۆگورۆ** / pezkoguro/: ناو. ناوی کایەیەکی منداڵانە 🇮🇷 از بازیهای کودکانە

**پەزمامێ** / pezmamê/: ناو. مەڕ؛ مەیشنا؛ میک؛ میەر 🇮🇷 گوسفند

**پەزمەندە** / pezmende/: ناو. پاشەکەوت؛ پەزمەنە؛ پەزمەمەنە 🇮🇷 پسانداز

**پەزمەنە** / pezmene/: ☜ پەزمەندە

**پەزمەنەکەر** / pezmeneker/: ناو. نیاتەکار؛ نۆتەکەر؛ نیاتەکەر 🇮🇷 اهل پسانداز

**پەزەکێفی** / pezekêfî/: ناو. مەڕەسوور؛ مەڕەکێوی 🇮🇷 میش کوهی

**پەزمەنە** / pezemene/: ☜ **پەزمەندە**

**پەزیان** / pezyan/: چاوگ. لێنران ≡ پُخته شدن

**پەزیزانک** / pezîzanik/: ناو. جیکلدان؛ جیقلدان؛ سیکەتۆرە ≡ چینەدان

**پەزیشکە** / pezîşke/: ☜ **پرمێشك**

**پەزین** / pezîn/: چاوگ. لێنان ≡ پُختن

• **پەزێر** / pezêr/: پاشەوشە. ــ پەزێر؛ ـ قبوولکەر ‹میوانپەزێر› ≡ ـ پذیر

**پەزێران** / pezêran/: چاوگ. تێنەپەر. //پەزێرات؛ ئەپەزێری؛ بپەزێرە// پەزێران؛ قبوول کردن؛ وەرگرتن ≡ پذیرفتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپەزێران

**پەزێرایی** / pezêrayî/: ناو. خزمەتی میوان ≡ پذیرایی

**پەزێرە** / pezêre/: ئاوەڵناو. پەسێرە؛ بەیات؛ شەو بە سەردا هاتوو (خوراده‌مەنی). هەروەها: **پەزێرە بوون؛ پەزێرە بوونەوە** ≡ شب‌مانده

**پەژ¹** / pej/: ناو. ١. پرژ؛ لق و پۆپ ٢. زوقم ٣. سێبەر؛ سێوەر ٤. پەسند؛ قبوول ‹شەڤا رەش پەژ ڤەدانە هاتە سەر من «جگەرخوێن»› ≡ ١. شاخەی نازک درخت ٢. سرماریزه ٣. سایه ۴. قبول

**پەژ²**: ئاوەڵناو. شلک و تورت و لە گەشە ≡ تُرد و شاداب

**پەژاج** / pejac/: ☜ **پەزاج**

**پەژار** / pejar/: ئاوەڵناو. خەمبار ‹تا مـن و گیـانی پەژارم تاوێ/ تۆزێ لەم دەورە بگێڕین چاوێ «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ≡ غمگین

**پەژارە** / pejare/: ناو. ١. خەم؛ کەسەر؛ کوڵ ‹پەژارەت شادیم جە بێخ ئاوەردەن/ دووریت ریشەی دڵ خەیمەکەن کەردەن «مەولەوی»› ٢. تاسە؛ ئارەزووی دیدار ‹پەژارەت هێزی لە ئەژنۆم بڕی/ لە هێلانەی دڵ شەوقی دڵ فڕی «پیرەمێرد»› ٣. نیگەرانی ‹من لەوێ تەنها پەژارەی تۆمە/ چ باکی چۆلی و ساردی گلکۆمە؟ «پیرەمێرد»› ≡ ١. غم ٢. آرزوی دیدار ٣. نگرانی

**پەژارەدار** / pejaredar/: ئاوەڵناو. پەژارەوار؛ خەمبار؛ دلتەنگ ≡ غمگین

**پەژارەوار** / pejarewar/: ☜ **پەژارەدار**

**پەژان** / pejan/: ناو. پەرژین؛ چیل ≡ پرچین

**پەژچاندن** / pejçandin/: چاوگ. هەڵبەزاندن ≡ جهاندن

**پەژراندن** / pejrandin/: چاوگ. ١. بە پیرەوە چوون ٢. سەلماندن؛ قەبووڵاندن ‹دڤێ ئەم بپەژرینن کو زمانێ کوردی گرنگترین نشنا کورد بوونییە› ٣. قبوول کردن ‹وێ دیاریا من نەپەژراند› ٤. بڕوا کردن ‹ئەڤ هەبوونا خودێ دپەژرینە› ٥. پەسند کردن ‹پەرلەمان قانوونەک نۆ پەژراند› ≡ ١. به پیشواز رفتن ٢. قبولاندن ٣. پذیرفتن ۴. باور کردن ۵. تصویب کردن

**پەژری** / pejrî/: ئاوەڵناو. وەرگیراو؛ قبووڵ کراو ≡ پذیرفته شده

**پەژرین** / pejrîn/: چاوگ. وەرگیران؛ قبووڵ بوون ≡ پذیرفته شدن

**پەژقاندن** / pejqandin/: چاوگ. پەژقین؛ پێ‌هەڵقوڕاندن ≡ در گلو ریختن

**پەژقین** / pejqîn/: ☜ **پەژقاندن**

**پەژک** / pejk/: ناو. ١. دەستەچیلەی ئاگر ٢. قاو؛ پووشووی دار ٣. پرژ؛ پژ؛ پەشک؛ لقی سەرەوەی دار ≡ ١. آتشگیره ٢. شاخه‌های پوسیده ٣. ساقه‌ی انتهایی درخت

**پەژکاندن** / pejkandin/: چاوگ. ١. لەت کردن؛ پارچە ـ پارچە کردن ٢. دڕاندن؛ دڕانن ≡ ١. پاره کردن ٢. دریدن

**پەژلاندن** / pejlandin/: چاوگ. چنینەوە؛ کۆکردنەوە (شتی وەک گەڵای داران) ≡ چیدن

**پەژلاندۆک** / pejlandok/: ناو. دەرمانی تووکەبەر

▪ واجبی

**پەژلە / pejle/**: ناو. شەپلە؛ ئیفلیج؛ دۆخـی کـەم بوون یان نەبوونی چالاکی دەماری لـە بەشـێکی لەشدا ▪ فلج

**پەژم / pejm/**: نـاو. ١. خـوری؛ هـەڕی ٢. پـەژ؛ زوقم؛ ئالشتە؛ وردەسەهۆڵ یان دەنکە بەفری زۆر ورد کە لە هەوای ساردا سبەینان نەرمێک دێتە خوار ▪ ١. پشم ٢. سرماریزە

**پەژمران / pejm(i)ran/**: ☜ پەژمەرین

**پەژمردە / pejmirde/**: ئاوەڵناو. ژاکاو؛ سـیس و لـە گەشە کەوتوو ▪ پژمُردە

**پەژمـەراو / pejmeraw/**: ئاوەڵـناو. پەژمـەریو؛ بێڕەنگ؛ سیسهەڵگەڕاو ▪ پژمُردە

**پەژمەرین / pejmerîn/**: چاوگ. پـەژمران؛ ژاکـان؛ سیس بوون ▪ پژمُردن

**پەژمەریو / pejmerîw/**: ☜ پەژمەراو

**پەژمینە / pejmîne/**: نـاو. پەژینە؛ کەڕوو؛ برش ▪ کپک

**پەژن / pejn/**: ناو. ١. هەست؛ شەس ٢. ئاسـەوار؛ نیشانەی بوونی شتێک بە ڕەنـگ، دەنـگ، بـۆن، تام، سێبەر و ... ‹پەژنا تشتەکی ژ دەرڤە دهێ› ▪ ١. احساس ٢. رد؛ اثر

**پەژندار / pejndar/**: ئاوڵناو. هەسـتیار؛ هەسـتۆک ▪ حساس

**پەژوم / pejom/**: ئاوەڵـناو. ژار؛ بێچـارە؛ بـێمـاڵ و حاڵ ▪ بینوا

**پەژە / peje/**: ناو. گەڵا؛ بەڵگ؛ پەلک ▪ برگ

**پەژەڵ / pejeł/**: ناو. هەژگەڵ؛ چڕ و چیلکە؛ لـق و پۆپی وشک ▪ ساقەهای خشکیدە

**پەژەنگ / pejeng/**: ناو. چەرم؛ ئاڤار؛ خام ▪ چرم

**پەژیران / pejîran/**: چاوگ. ویستن؛ قبووڵ کردن ▪ پذیرفتن

**پەژیراندن / pejîrandin/**: چاوگ. ڕازی کـردن ▪ قبولاندن

**پەژیک / pejîk/**: ناو. ١. هەڵامەت؛ پەسیو؛ ئالامات ٢. ئاهۆ؛ ئازار ٣. خەڵف؛ پەژی نەرم و ناسک؛ لقی نەرم و شلی دار ▪ ١. زُکام ٢. واگیر ٣. شاخەی نرم و نازک درخت

**پەژین / pejîn/**: ناو. کوێستان؛ چیا ▪ کوهستان

**پەژینە / pejîne/**: ☜ پەژمینە

**پەژیوان / pejîwan/**: ئاوەڵناو. پەشیمان؛ پێـژەوان؛ پۆشمان؛ ژوڤان؛ ژیڤان ▪ پشیمان

**پەژیوانی / pejîwanî/**: نـاو. پەشیمانی؛ پۆشمـانی ▪ پشیمانی

**پـەژێو / pejêw/**: ئاوەڵـناو. پەشـێو؛ پەرێشـان ▪ پریشان

**پەس[1] / pes/**: ☜ پەز[1]

**پەس[2]**: ئاوەڵناو. ١. وەڕەز؛ جاڕز؛ عاجز ٢. بێئاکـار؛ سووک؛ بێشەرم ٣. دۆڕاو لە قوماردا ▪ ١. پکر ٢. پست ٣. بازندەی قمار

**پەس[3]**: دەنگ. وشـەی دەنـگ دانی گـاجووت بـۆ تەک دانە خوارەوە یا هاتنـە دواوە ▪ واژەی پـس راندن گاو

**پەس[4]**: ئامراز. کەوابوو؛ سا؛ ئەدی ‹پەس مـن دەڕۆم؛ پەس بزانە چۆنە› ▪ پس

**پەس -[5]**: پێشوشە. پاش- ‹پەساو؛ پەساخۆر› ▪ - پس

**پەسا[1] / pesa/**: ناو. ١. پێخوێ؛ پاسا؛ ئەو قـوڕەی بۆ سواغ گیراوەتەوە ٢. مایـەی چێشـتی هێشـتا لێنەنراو ‹پەسای دۆڵمە› ٣. ماکە سەرەتاییەکانی پێکهێنەری چێشت ٤. قـۆپی؛ دارسـتانی قـەراخ چۆم ‹لەو پەسا پڕ و چرەدا بزر بوو› ▪ ١. خازە؛ گِـلِ اندودن ٢. مایەی پیش از پخت غذا ٣. مـواد اولیـەی غذا ٤. بیشەی کنار رودخانە

⊡ **پەسا بۆ کەسێ گرتنەوە** *(مەجاز)* پیلان بۆ کەسێ گێران ‹با بـزانین چ پەسـایەکیان بـۆ گرتگەسـەوە، باوەڕ ناکەم سەر دەر کـا› ▪ بـرای کسـی توطئـە

چیدن

**پەسا داخستن:**[مەجاز] جارێ نەڕۆیشتن و مانەوە ‹ئەم پەسا ئەو دایخستگە، جارێ هاینە خزمـەتیا!› ≤ بە این زودیها نرفتن

**پەسا**[۲]: ↓

▣ **لە پەسا:** لە پەستا؛ بێنێوان؛ لە سەر یـەک ≤ پشت سر هم

**پەساپۆرت** / pesaport/: ☜ **پاساپۆرت**

**پەسا ـ پەسا** / pesa pesa/: ئاوەڵکار. پەسـاپەس؛ لە پەستا؛ لە پەسا؛ بێ پسانەوە؛ یەک لە دوو یەک ≤ پیاپی؛ پیوستە

**پەساخوڕ** / pesaxuř/: نـاو. پاشـاخۆر؛ پاشـاخۆڕ؛ پێشـاخوڕ؛ قەسەڵـی بـەجێمـاو لـە ئـاخوڕدا ≤ تەماندەی علف در آخور

**پەسار** / pesar/: ناو. ۱. نزار؛ نسار؛ لای سێبەر لـە شاخ و کێو ‹کەروێشـکەی گـەنم بـەهاران/ بـەفری هاوین لە پەساران «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ۲. بۆسە؛ حەشارگەی ڕاوچی ۳. باپەنا؛ پەنای با و بـاران ≤ ۱. نِسار ۲. کمین شکارچی ۳. جای محفـوظ از بـاد و باران

**پەساردن** / pesardin/: ☜ **هەڵپەساردن**

**پەسارده** / pesarde/: ئاوەڵناو. پاڵدراو ‹حاشا لە چت پەسارده، تاوی بـەم لا، تـاوێ بـەو لا! «مەتـەڵ»› ≤ تکیەدادە

**پەسارنایەوە** / pesarnayewe/: ☜ **هەڵپەساردن**

**پەساو** / pesaw/: نـاو. ۱. پاشاو؛ ئاوێ کـە لـە ئـاو داشتندا لە زەوی دەردەچـێ ۲. ☜ **پاشـاراو** ۳. پەزاو؛ دەراوی مەڕ ئاودان؛ جێ ئاودانی مێگەل ٤. ئاوێ کە دوای هەویرشێلان دەمێنەتەوە ≤ ۱. آب مازاد از آبیاری ۲. ☜ **پاشاراو** ۳. آبشخور گوسفندان ۴. پسماندەی آب خمیر

**پەساپەس** / pesaypes/: ☜ **پەسا ـ پەسا**

**پەسپندە** / pespinde/: ئاوەڵناو. پەسپەندە؛ بەدفەڕ؛ ئاکارخراپ؛ ناپەسند؛ پەست ≤ پست

**پەسپۆر** / pespor/: ئاوەڵناو. سەڵیتەی زمـان‌درێـژ ≤ سلیتە

**پەسپەزەکێویلە** / pespezekêwîle/: ☜ **پەسپەسەکۆڵە**

**پەسپەسکەرە** / pespeskere/: ☜ **پەسپەسەکۆڵە**

**پەسپەسەکۆڵە** / pespesekołe/: نـاو. پسپسەکۆڵە؛ پسپسەکەڵـە؛ پەسـپەزەکێویلە؛ پەسپەسـکەرە؛ پەسپەسـەکەرە؛ جاڵجاڵـووکە ≤ زُرزورە (نـوعی عنکبوت)

**پەسپەسەکەرە** / pespesekere/: ☜ **پەسپەسەکۆڵە**

**پەسپەسـەکێوی** / pespesekêwî/: نــاو. جاڵجاڵـووکەیەکی بـێئـازاری کێـوی ≤ نـوعی عنکبوت

**پەسپەندە** / pespende/: ☜ **پەسپندە**

**پەست**[۱] / pest/: ئاوەڵناو. ۱. نەوی؛ نزم ‹گـەر تـووڕە بێ زل دەکاتە بەردەست/ دڵخۆش بـێ بڵـند دەکـا شتی پەست «هەژار، *مەم و زیـن*»› ۲. ئاکـارخراپ؛ بەدفەڕ ‹هەموو سووک و چرووک و پەست و بەدخۆ/ هەموو ناپاک و نائینسان و نامۆ «هێمن»› ۳. وەڕەز؛ جاڕز ‹کە دێ، پەستم، کـە نایـە ئـارەزووی دڵ/ بـە دوویا وێڵ ئەبێ مـەنزڵ بـە مـەنزڵ «گـۆران»› ≤ ۱. کم‌ارتفاع ۲. پست ۳. پَکر

▣ **پەست بوون:** وەڕەز و جاڕز بوون ≤ پَکر شدن

**پەست ـ**[۲]: پێشوشە. پەس ـ ؛ پاش ـ ‹پەستاو› ≤ پس ـ

**ـ پەست**[۳]: پاشەوشە. ۱. ـ ئـاخن ‹پالەپەسـت› ۲. ـ شێل؛ کوتراو ‹پێپەست› ≤ ۱. چپان ۲. کوبیدە

**پەستا** / pesta/: ↓

▣ **لە پەستا:** لە پەسا؛ بێنێـوان؛ لـە سـەر یـەک ‹زگ‌تێر و دەم دەستاڕن/ لە پەسـتا جـۆ دەهـاڕن «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ≤ پیوستە؛ پشت سر هم

**پەستا ـ پەستا** / pesta pesta/: ئاوەڵـکار. بــە شوێن‌یەکدا؛ بێنێوانبڕ ≤ پیاپی

**پەســـــتان** / pestan/: چـــاوگ. پەســـــــتاندن؛ پەستاندنەوە؛ ئاخنین؛ بە هێز تێراکردن ‹مـاڵ لـە ژێر پەستان و بە برسییەتی هەستان! «مەسەل»› 🇮🇷 چپاندن

**پەستاندن** / pestandin/: ☜ **پەستان**

**پەستاندنەوە** / pestand(i)newe/: ☜ **پەستان**

**پەستاو**[1] / pestaw/: ناو. ١. ئاوی دانەوێڵەی کوڵاو ‹لەواشێکی لە دەڵچە چرچەکەی دەم/ وەلـەو تـامی نییە پەسـتاوی دانـوو «ئـەدیب»› ٢. پەسـا؛ پاسـا؛ پێخوێ؛ ئەو قوڕەی بۆ سـواغ گیراوەتـەوە 🇮🇷 ١. آب غلەی آبپز ٢. خازە؛ گِلِ اندودن

◘ **پەستاو دەرهێنان:** قوڕ گرتنەوە بۆ خشـت بـڕین 🇮🇷 گِل ساختن

**پەستاو ڕاخستن:** پاسـتاو ڕاخسـتن؛ گـڵ پـان کردنەوە و ئـاو تـێگـرتن بـۆ قـوڕ گرتنـەوەی خشت 🇮🇷 گِل خشت را سرشتن

**پەستاو**[2]: ئاوەڵناو. ئاخناو 🇮🇷 آکندە

**پەستاوتن** / pestawtin/: چاوگ. تێپەر. //پەستاوتت؛ دەپەستێوی؛ بپەستێوە// پەستاوتنەوە؛ پەستینەوە: ١. ئاخنین؛ پەستاندن ٢. شێلان (بە پـا و ...) 🇮🇷 ١. چپاندن ٢. با پا افشردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپەستاوتن

**پەستاوتنەوە** / pestawtinewe/: ☜ **پەستاوتن**

**پەستاوتە** / pestawte/: ئاوەڵناو. ئاخنراو؛ تـەپێنراو 🇮🇷 آکندە

**پەســتران** / pestiran/: چـــاوگ. تێنەپـــەڕ. نادیــــار //پەسـترای؛ دەپەسـترێی؛ بپەسـترێ// ئـاخنران 🇮🇷 آکندە شدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: پەسـتراو/ چـاوگی نـەرێنی: نەپەستران

**پەستراو** / pestiraw/: ئاوەڵناو. پەستراوە؛ پەستواو: ١. ئاخندراو ٢. شـێلدراو 🇮🇷 ١. آکنـدە ٢. پـایکوب شُدە

**پەستراوە** / pestirawe/: ☜ **پەستراو**

**پەستک** / pestik/: ناو. کڵۆمیوەی پێکەوە نووسـاو 🇮🇷 لتکە

**پەستن** / pestin/: چاوگ. پەسـتین؛ پەسـتنەوە؛ پەستاوتن 🇮🇷 آکندن

**پەستنەوە** / pestinewe/: ☜ **پەستن**

**پەستوان** / pest(i)wan/: چاوگ. ئاخنین؛ بە نهێم خستنە ناو 🇮🇷 آکندن با فشار

**پەستواو** / pestiwaw/: ☜ **پەستراو**

**پەستو** / pestû/: نـاو. ١. کووپەڵـەی کاشـی ٢. وچخانە؛ خەڵوەتی؛ پەسـیو؛ پاشـخان؛ پاسـخان؛ هێشخان؛ هەوێشخان؛ گەزنـە؛ گەنجـە؛ کـولێن؛ هۆدەیـەکی چکۆلـە لـە پشـتەوەی وەتـاغ یـان دووکاندا 🇮🇷 ١. سبوی کوچک ٢. پستو

**پەســتە** / peste/: نـاو. ١. چۆغــک؛ پەســـتەک؛ سوخمەی بێقۆڵ لە لبـاد ٢. بەسـتە؛ سـەربەند؛ گـۆرانی سووکەڵـە و بـنبزێوکـە 🇮🇷 ١. چوخـە ٢. ترانەی ضربی

**پەستەک** / pestek/: نـاو. چۆغــک؛ ســوخمەی بێقۆڵی لە لباد 🇮🇷 چوخە

**پەســتەکۆڵە** / pestekołe/: نـــاو. هـــــەرەوەزی نمدماڵی 🇮🇷 مراسم نمدمالی

**پەستی** / pestî/: نـاو. ١. نەویایــەتی؛ نزمــی ٢. *[مـەجاز]* ناکەســی؛ بەدفــەڕی و بــێئاکــاری ٣. وەڕەزی؛ جـاڕزی ٤. بێچـارەیی؛ بەسـتەزمانی؛ زەلیلی ‹لە بەر پەستی گەلی کوردە، کـە وا ڕەنـج و تەقالامە/ لە سەر ئەم هۆزە چل ساڵە بە تەنیا هەوڵ و داوامە «قانع»› 🇮🇷 ١. پستی (مقابل بلندی) ٢. رذالت ٣. پَکری ٤. بیچارگی

**پەستین** / pestîn/: ☜ **پەستن**

**پەستینەوە** / pestînewe/: ☜ **پەستاوتن**

• **پەستێن** / pestên-/: پاشەوشە. ـ تەپێن؛ پەستێنەر ‹بەفرپەستێن› 🇮🇷 چپاندە

**- پەستێو / pestêw-/**: پاشگر. ـــ پەستێنەر 🇮🇷 چپاننده

**پەستێوران / pestêwran/**: چاوگ. هەسەمیای؛ پتەو بوونەوە 🇮🇷 فشُرده و سفت شدن

**پەسر / pesr/**: ☜ **پەسەر-**

**پەسرپێرارەکە[1] / pesirpêrareke/**: ناو. پەرەوێرار؛ پەرەوێرارەنە؛ پەرەوێرارەوە؛ پەسەپێرارەکە؛ پەسەپێرار؛ سێ ساڵ لەمە پێش 🇮🇷 پس‌پیرارسال؛ سه سال پیش

**پەسرپێرارەکە[2]**: ئاوەڵکار. پەرەوێرار؛ پەرەوێرارەنە؛ پەرەوێرارەوە؛ پەسەپێرارەکە؛ پەسەپێرار؛ لە سێ ساڵ لەمەو پێشدا 🇮🇷 پس‌پیرارسال؛ سه سال پیش

**پەسرپێرەکە / pesirpêreke/**: ناو. بەستەرپێر؛ وارۆژوناوەڕۆژا؛ سێ ڕۆژ لەمە پێش 🇮🇷 پس‌پریروز

**پەسقەرەوڵ / pesqerewił/**: ناو. پاشقەرەوڵ؛ چاودێری پاش سپا 🇮🇷 عقبه‌ی لشکر

**پەسقەڵە / pesqeɫe/**: ناو. قەشمەر؛ تیز بە خەڵک‌کەر 🇮🇷 مسخره کننده

**پەسڵان / pesɫan/**: ناو. پەشڵان؛ سەڵا؛ قیا؛ قیامەت؛ ئاخێزانەوە؛ ڕابوونەوە؛ ژیانەوەی دوای مەرگ؛ هەستانەوەی دوای مردن «... دەهندەیە و دلۆڤانە/ خاوەنی ڕۆژی پەسلانە ... «هەژار، *قورئان*»» 🇮🇷 رستاخیز

**پەسمار / pesmar/**: ناو. شکایەت‌لێ‌کراو 🇮🇷 مُتشاکی

**پەسمەندە / pesmende/**: ناو. پەسمەنە: ١. باقی؛ پاشماوە ٢. پەزمەندە؛ پاشەکەوت 🇮🇷 ١. پسمانده ٢. اندوخته

**پەسمەنە / pesmene/**: ☜ **پەسمەندە**

**پەسن / pesn/**: ناو. ستایش؛ ڕەوش؛ کاری پێدا هەڵگوتن؛ پاسین «پەسنت چ بدەم؟ ئەوەندە جوانی/ وەک هەرچی بڵێم جوانی، وا نی «هەژار، *مەم و زین*»» 🇮🇷 ستایش

⊡ **پەسن دان**: تاریف کردن؛ پێ‌هەڵگوتن؛ ستایش کردن 🇮🇷 ستایش کردن

**پەسن[1] / pesin/**: ناو. پەسەن؛ پەسەن؛ پەسەند؛ پەسند؛ کێز؛ بەدڵ؛ کار و ڕەوتی بەردڵ کەوتن و هەڵبژاردن «دایکم ئەو کیژەی بۆم پەسن کردبوو» 🇮🇷 پسند

**پەسن[2]**: ئاوەڵناو. پەسند؛ پەسەن؛ پەسەند؛ لەبەردڵ؛ بەدڵ؛ وەدڵ؛ بەردڵ 🇮🇷 پسندیده؛ مورد پسند

**پەسند / pesind/**: ☜ **پەسن**

⊡ **پەسند کردن** پەسەن کردن: ١. دڵ گرتن؛ بە دڵ بوون؛ بە شیاو زانینی شت یان کەسێک ٢. چەسپاندن؛ ئەرێ لێدان «کارەکەتان پەسند دەکەم» ٣. ڕای ڕەوا لە سەر کار یان پلان یان قسەیەک دان، بەتایبەتی لە لایەن بنکەیەکی فەرمییەوە «پارلەمان پێشنیارەکەی پەسند کرد» ٤. هەڵبژاردن «لەم چوارە، کامیان پەسند دەکەی؟» 🇮🇷 ١. پسندیدن ٢. تأیید کردن ٣. تصویب کردن ۴. انتخاب کردن

**پەسندار / pesindar/**: ☜ **پەسندەر**

**پەسندکراو / pesindk(i)raw/**: ئاوەڵناو. ڕەوا؛ قەبووڵ 🇮🇷 پذیرفته

**پەسندەر / pesinder/**: ناو. پەسندار؛ ئەوی کاری پێداهەڵگوتن و تاریف کردنە 🇮🇷 مدّاح

**پەسندی / pesindî/**: ناو. باشی؛ چاکی 🇮🇷 خوبی

**پەسنکراو / pesink(i)raw/**: ئاوەڵناو. پەسەن‌کراو؛ هەڵبژێردراو؛ دەست لە سەر دانراو 🇮🇷 مورد پسند

**پەسوان / peswan/**: چاوگ. خێوان؛ ڕێک‌کەوتن 🇮🇷 مُتفق شدن

**پەسە[1] / pese/**: ناو. پەسا؛ کەرستەی خواردەمەنی وەک ئارد و ئاو بۆ نان 🇮🇷 مواد اولیه‌ی خوراکی

**پەسە-[2]**: پێشوشە. پاش «پەسەپێرێ» 🇮🇷 پس -

**پەسەپێرار / pesepêrar/**: ☜ **پەسرپێرارەکە**

**پەسەپێرارەکە / pesepêrareke/:** ☜ پەسرپێرارەکە

**پەسەر ـ / peser/:** پێشوشە. پەسر- ‹پەسەرپێری› 🇮🇷 پس-

**پەسەک / pesek/:** ناو. پەستەک؛ چۆغک 🇮🇷 چوخە

**پەسەن / pesen/:** ☜ پەسن

▣ **پەسەن کردن:** ☜ پەسند کردن

**پەسەناز / pesenaz/:** ناو. پەسەنناز؛ پاشەکەوت 🇮🇷 پس‌انداز

**پەسەند / pesend/:** ☜ پەسن

**پەسەنکراو / pesenk(i)raw/:** ☜ پەسن‌کراو

**پەسەنناز / pesennaz/:** ☜ پەسەناز

**پەسەوپووسە / pesewpûse/:** ناو. پرتاڵ؛ خرت‌وپرت 🇮🇷 خرت‌وپرت

**پەسیرە / pesîre/:** ناو. پەسیلە؛ بەرسیلە؛ قۆرە 🇮🇷 غورە

**پەسیرەمارانە / pesîremarane/:** ناو. قۆرەمارانە؛ بەرسیلەمارانە؛ هاڵەمارانە 🇮🇷 نوعی غورە

**پەسیسە / pesîse/:** ناو. ١. چێشتی زۆر کوڵاوی لێک‌هاڵاو ٢. کەرەسیسە؛ زوقم؛ وردیلە بەفری کە لە سەرمای زۆردا نەرمێک دەباری 🇮🇷 ١. آش بسیار پُختەی درهم آمیختە ٢. سرماریزە

**پەسیفداری / pesîfdarî/:** ☜ پەسیودار

**پەسیڤ / pesîv/:** ناو. پەسیو؛ هەلامەت؛ ئالامەت 🇮🇷 زُکام

**پەسیلە / pesîle/:** ناو. بەرسیلە؛ قۆرە 🇮🇷 غورە

**پەسیِنای / pesînay/:** چاوگ. پەسند کردن 🇮🇷 پسندیدن

**پەسینیای / pesînyay/:** چاوگ. پەسند بوون؛ پەسند کران 🇮🇷 پسندیدە شدن

**پەسیو / pesîw/:** ناو. ١. ☜ پەسیڤ ٢. سووچ؛ قوژبن؛ کەلێن ‹سووکتر بووم لە پرزە کایەک/ نە پەسیوێک نە پەنایەک «هەژار، *بۆ کوردستان*»› 🇮🇷 ١. زُکام ٢. کُنج

**پەسیودار / pesîwdarî/:** ناوەڵناو. ئارسمی؛ پەسیفداری؛ پەسیوگرتی؛ هەلامەتدار 🇮🇷 زُکامی

**پەسیوگرتی / pesîwgirtî/:** ☜ پەسیودار

**پەسێرە / pesêre/:** ☜ پەزێرە

**پەش[1] / peş/:** ناو. ١. پەق؛ کاری دەرهێنان و تۆقاندنی شتێ ٢. بەش؛ پاژ 🇮🇷 ١. عمل متلاشی کردن ٢. سهم

**پەش[2]:** دەنگ. وشەی لێخوڕینی گا لە جووتا 🇮🇷 کلمەی راندن گاو هنگام شخم

**پەشار / peşar/:** ناو. سیاسەت 🇮🇷 سیاست

**پەشاری / peşarî/:** ناوەڵناو. ڕامیاری؛ سیاسی 🇮🇷 سیاسی

**پەشارەش / peşařeş/:** ☜ پشارەش

**پەشت / peşt/:** ناو. پەشتی؛ گشتەک؛ بەن یا دەزووی بادراو 🇮🇷 نخ تابیدە

**پەشتو / peştû/:** ناو. لە زمانگەلی ئێرانی ڕۆژهەڵاتییە کە زۆرتر لە ڕۆژهەلات و باشووری ئەفغانستان و باکووری ڕۆژاوای پاکستاندا قسەی پێ دەکەن 🇮🇷 پَشتو

**پەشتەماڵ / peştemał/:** ناو. پشتەماڵ؛ خاولی؛ مەرحەمە 🇮🇷 حولە

**پەشتی / peştî/:** ☜ پەشت

**پەشک / peşk/:** ناو. تنۆک؛ دڵۆپ؛ کەمترین ئەندازە لە ئاو 🇮🇷 قطرە

**پەشکاپیس / peşkapîs/:** ناوەڵناو. پرشکەپیس؛ بیژوو 🇮🇷 حرامزادە

**پەشلاندن / peşlandin/:** چاوگ. پەرژ و بلاو کردن 🇮🇷 پراکندن

**پەشلین / peşlîn/:** چاوگ. پەرژ و بلاو بوون 🇮🇷 پراکندە شدن

**پەشلان / peşłan/:** ناو. پەسلان؛ سەلا؛ قیامەت 🇮🇷 رستاخیز

**پەشم[1] / peş(i)m/:** ناو. ١. خوری ٢. چۆغەی

بووزوو 🇮🇷 ١. پشم ٢. پارچەی دستباف پشمی
◙ **پەشم بەرگوێز**: ١. چۆغە و ڕانک ٢. تۆپەبووزوو؛ پارچەی سەر و ژێری بەرگ لە شاڵ 🇮🇷 ١. لباس پشمی دستباف مردانه ٢. پارچەی دستباف پشمی، به اندازەی یک دست لباس

**پەشم**[٢]: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* پووچ و بێبایەخ ‹کامی کچ و هەتیوی شیرین بێ ڕایدەکێشن/ هاوار دەبەنە بەر کێ؟ پەشمە دەخیل و ئامان «حاجی قادر»› 🇮🇷 کشک؛ بی اهمیت

**پەشمەشیشە** / peşmeşîşe/: ناو. ڕیشاڵی شیشە 🇮🇷 پشم‌شیشه

**پەشمەک** / peşmek/: ناو. جۆرێ شیرینییە لە شەکری دروست دەکەن و لە خوری دەکا 🇮🇷 پشمک

**پەشمین** / peşmîn/: ئاوەڵناو. دروستکراو لە خوری 🇮🇷 پشمینه

**پەشمینە** / peşmîne/: ناو. پارچەیەکی جوانە لە خوری ساز دەکرێ 🇮🇷 پارچه‌ای زیبا از پشم

**پەشۆک** / peşok/: ئاوەڵناو. پەرێشان؛ شێواو؛ شڵەژاو 🇮🇷 آشفته

**پەشۆکان** / peşokan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //پەشۆکای؛ دەپەشۆکێی؛ بپەشۆکێ// پەشۆکیان؛ سەر لێشێوان؛ بیر تێکچوون ‹لە بێدەنگی ئەترسێ و ناشتوانێ بگری، چونکە پەشۆکاوە، هەموو دنیا لە بەر چاوی دەبێتە یەک پرسیار: ژیان شینە یا شاییە؟ «سوارە»› 🇮🇷 آشفته شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: پەشۆکاو/ چاوگی نەرێنی: نەپەشۆکان

**پەشۆکاندن** / peşokandin/: چاوگ. تێپەڕ. //پەشۆکاندت؛ دەپەشۆکێنی؛ بپەشۆکێنە// تێکەڵاو کردنی بیری کەسێک 🇮🇷 آشفته کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـــ/ چاوگی نەرێنی: نەپەشۆکاندن

**پەشۆکاو** / peşokaw/: ئاوەڵناو. شێواو؛ سەرلێشێواو ‹پاییزە، دار و دەوەن بێبەرگە/ دڵ پەشۆکاوی خەیاڵی مەرگە «سوارە»› 🇮🇷 آشفته

**پەشۆکنای** / peşoknay/: چاوگ. پەشۆکاندن 🇮🇷 آشفته کردن

**پەشۆکی** / peşokî/: ناو. پەرێشانی 🇮🇷 آشفتگی

**پەشۆکیان** / peşok(i)yan/: ☜ **پەشۆکان**

**پەشۆکیای** / peşokyay/: چاوگ. پەشۆکان 🇮🇷 آشفته شدن

**پەشۆنای** / peşonay/: چاوگ. پەشێو کردن 🇮🇷 پریشان کردن

**پەشۆیای** / peşoyay/: چاوگ. پەشێو بوون 🇮🇷 پریشان شدن

**پەشو** / peşû/: ☜ **پەپووسلێمانە**

**پەشە** / peşe/: ناو. پەخشە؛ مێشوولە؛ پێشی؛ پێشکە؛ تۆفانە 🇮🇷 پشه

**پەشەبەند** / peşebend/: ناو. کوللە؛ پێشکەگیرەوە 🇮🇷 پشه‌بند

**پەشەنگ** / peşeng/: ناو. پێشاهەنگ؛ سەرجەلە 🇮🇷 پیشاهنگ

**پەشیل** / peşîl/: ئاوەڵناو. وێران؛ ڕووخاو؛ هەڕفتی 🇮🇷 ویران

**پەشیلان** / peşîlan/: چاوگ. پەشیلین؛ ڕووخان؛ وێران بوون 🇮🇷 ویران شدن

**پەشیلاندن** / peşîlandin/: چاوگ. ڕووخاندن؛ هەرماندن؛ ڕماندن 🇮🇷 ویران کردن

**پەشیلین** / peşîlîn/: ☜ **پەشیلان**

**پەشیمان** / peşîman/: ئاوەڵناو. پاشگەز؛ پەژیوان؛ پۆژوان؛ پێژیوان؛ ژیڤان ‹ڕۆژێ دێتە پێش بۆی پەشیمان بی/ لە من خراپتر بۆی پەرێشان بی «قانع»› 🇮🇷 پشیمان

**پەشیمانی** / peşîmanî/: ناو. قەرگەڕ؛ قەگەڕ؛ ناسور؛ حەشمەتی: ١. هەستی ناخۆش لە دوای

کردنی کارێکی ناڕەوا یان نەکردنی کارێکی باش ‹پیر مەوی دلڕێش وە پەشیمانی/ بەقا نەدارۆ ئەی دونیای فانی «ئازادیی کەلهوڕی»› ٢. دۆخی دەس بەردان و هەڵگەڕانەوە لە بیر یان ئاکاری پێشوو ‹فدات بام پەی چێش پەشیمانیت بەرد؟/ چەند سەوگەندت وەرد؟ چەند جار عەهدت کەرد؟ «خاتوو جەهانئارا»› ✉ ١و٢. پشیمانی

**پەشێو** / peşêw/: ئاوەڵناو. ١. پەرێشان؛ بیربڵاو ‹هەر مانگێ نەو بۆ حالم پەشێوەن/ هیلالیش شێوەی ئەبرۆی تۆش پێوەن «مەولەوی»› ٢. شێواو؛ ئاڵۆز ‹چنوور بۆ زولفت لوول و پەشێوە/ وەنەوشە ملکەچ خالی لای لێوە «پیرەمێرد»› ✉ ١. پریشان ٢. آشفته

**پەشێوان** / peşêwan/: چاوگ. پەشێویان: ١. بیر تێکچوون؛ ئاوەز ئاڵۆزان ٢. ئاڵۆز و پەرێشان بوون ✉ ١. آشفتن ٢. عصبی شدن

**پەشێواو** / peşêwaw/: ئاوەڵناو. شێواو؛ ئاڵۆزاو ‹مەکەن لۆمەی پەشێویی دڵ کە ئەمشەو/ پەشێواوە لە بەر پەرچەم پەشێوان «نالی»› ✉ پریشان

**پەشێوە** / peşêwe/: ☜ **پەشێویتی**

**پەشێوی** / peşêwî/: ناو. ١. ئاڵۆزاوی دەروونی؛ شێواوی ٢. بشێوە؛ ئاژاوە ✉ ١. پریشانی ٢. آشوب

**پەشێویان** / peşêwyan/: ☜ **پەشێوان**

**پەشێوینی** / peşêwênî/: ناو. ئاژاوە؛ پەشێوە ✉ آشوب؛ بلوا

**پەفک** / pefik/: ناو. پەفک؛ پیفۆک؛ کیفۆک؛ گیایەکە سەلکەکەی بە کولاوی یان بە برژاوی دەخۆن ✉ گیاهی با غُدەی خوارکی

**پەڤ**[1] / pev/: ئاوەڵکار. پێکەوە ✉ باهم

**پەڤ**[2]: ئامراز. دەگەڵ؛ تەک ✉ با

**پەڤڕا** / pevřa/: ئاوەڵکار. دەگەڵ یەکتر؛ پێکەوە؛ بە یەکەوە؛ وە یەکەو؛ تەک یەکا ✉ باهم

**پەڤک** / pevik/: ☜ **پەفك**

**پەڤلی** / pevlî/: ئاوەڵکار. پێکەوە ✉ باهم

**پەڤیژۆک** / pevîjok/: ناو. دمەڵ؛ دومل؛ کوان ✉ دُمل

**پەق** / peq/: ناو. پەش؛ کاری دەرهێنان و تۆقاندنی شتێ ✉ عمل متلاشی کردن

**پەقان** / peqan/: چاوگ. پەقیان؛ پەقین؛ تەقین؛ ترۆقین ✉ ترکیدن

**پەقاندن** / peqandin/: چاوگ. تەقاندن؛ تەرەقاندن ✉ ترکاندن

**پەقپەقۆشک** / peqpeqoşik/: ناو. پەقپەقووژک؛ گیایەکە بەرەکەی لە ترووکاندندا تەقەی دێ ✉ گیاهی است

**پەقپەقۆک** / peqpeqok/: ناو. بەری گیایەکە ✉ ثمر گیاهی است

**پەقپەقووژک** / peqpeqûjik/: ☜ **پەقپەقۆشك**

**پەقرەج** / peqrec/: ناو. پەقرەنج؛ سەتڵ ✉ سَطل

**پەقرەنج** / peqrenc/: ☜ **پەقرەج**

**پەقژ** / peqj/: ناو. بۆقژە؛ زیپکەی ناو دەمی ساوا ✉ جوش دهان کودک

**پەقژک** / peqjik/: ناو. بڵق؛ پەقویشک؛ بلقی سەر ئاو ✉ حُباب

**پەقژین** / peqjîn/: چاوگ. موچڕک پێدا هاتن ✉ مورمور شدن

**پەقڵانجقە** / peqłanc(i)qe/: ☜ **پاقلانجی**

**پەقویشک** / peqwîşk/: ☜ **پەقژك**

**پەقیان** / peqyan/: ☜ **پەقان**

**پەقیای** / peqyay/: چاوگ. قڵتیای؛ قەڵەشان ✉ ترکیدن

**پەقیشک** / peqîşik/: ناو. تۆقڵە؛ بڵق؛ بلۆق ✉ حُباب

**پەقین** / peqîn/: ☜ **پەقان**

**پەک**[1] / pek/: ↓

⊡ **پەک بون:** دامان؛ داکەوتن؛ دەستەوسان بوون ‹پیری پرزەی لێ بڕیوم، تەواو پەکمە› ✉

درماندن

**پەک خستن**: پـەک دان: ١. لـە کـار خسـتن؛ بـێبـەهرە کـردن ‹گـرانی، پـەکی بـە کارمـان خستووە› ٢. پەک خستنەوە؛ هەڵوەشـاندنەوە؛ نە لێکردنەوە ‹ئـەوا بـوو بـە ساڵـێ، هـەر بـڕیار دەدەن و هەر پـەکی ئەخـەن!› ٣. دەستەوسـان کردن ‹بێپووڵی پەکی خستووم، دەنا من کەی لە کار ترساوم؟› 🇮🇷 ١. از کار انداختن ٢. مُنتفی کردن ٣. درمانده کردن

**پەک دان**: ☜ **پەک خستن**

**پەک کەوتن/ کەفتن**: ١. لە کار کەوتن؛ بێکەڵک کـەوتن ‹لەبـەر گـرانی، هـەموو کـارێ پـەکی کەوتووە› ٢. گیر تێکەوتن؛ هەڵوەشـانەوە؛ نـە لێکران ‹بڕیار بوو بانگمان بکەنەوە بـۆ کـار، بـەڵام دیسان پەکی کەوت!› ٣. دامـان؛ دەستەوسـان بوون ‹نانی دەروێشی، هـەتا مـاوی، پـەکت بـۆی ناکەوێ «موفتی پێنجوێنی»› ٤. خەم خـواردن؛ دڵگران بوون ‹بە کوشـتن دا خەڵـک ئـوردوو بـە ئـوردوو/ پـەکی پـێ ناکـەوێ ویجـدانی مـردوو «هێمن»› ٥. پیر و کەلەلا بوون ‹پەکی کەوتووە دەرۆژووری پێناکرێ› ٦. چاک نەمان؛ لە ڕەوتی پێشوو لادان ‹جاران باش بوو سـەر دایکـی دەدا، ئەویش پەکی کەوتووە› 🇮🇷 ١. از کار/ رونق افتـادن ٢. مُنتفی شدن ٣. درماندن ۴. غصه خوردن ۵. پیـر و فرتوت شدن ۶. زایل شدن

**پەک**[٢]: دەنگ. ١. وشەی سەیرمان ‹پەک لەو قسـە بنشرە!› ٢. وشەی دەربڕینی خەم ‹پـەک! ماڵـم کاول بوو› 🇮🇷 ١. وه؛ کلمەی تعجب ٢. وای؛ کلمـەی افسوس

**پەککو** / pekkû/: ☜ **پەکو**

**پەککەوتوو** / pekkewtû/: ئاوەڵناو. پەککەوتە: ١. تووشـی گرفـت هـاتوو ٢. یـەکجاری پـیر و لەکارکەوتوو 🇮🇷 ١. درمانده ٢. پیر و فرتوت

**پەککەوتە** /pekkewte/: ☜ **پەککەوتوو**

**پەکو** / pekû/: دەنگ. پـەککوو: ١. وشـەی سەیرمان ‹جا ڕەنگە هێندێ کـەس بڵـێن: پـەکوو لەوێ حەلامەتێ! جاکوو ئەو سێ دۆزە قۆزەت لۆ لێک دەدرێ؟ کـێ ئـەو ماشـەرە ئاڵـۆزەی یـەکلا دەکـا و پساوەکەی بۆ تێک دەخرێ؟! «هەژار، *چوار نامیلکە*»› ٢. حـەیف؛ داخەکـەم؛ وشـەی داخ و خـەم ‹لـە نوێنی گلا پەکوو کە نوستوو زۆرن/ بەربیر و خـەیاڵ کـەمـن، لـەبیرچـوو زۆرن! «هـەژار، *چوارینـەکانی خەیام*»› 🇮🇷 ١. وه؛ کلمەی تعجب ٢. دریغا؛ کلمـەی افسوس

**پەکەر** / peker/: ئاوەڵناو. جاڕز؛ وەڕەز 🇮🇷 پکر

**پەکەری** / pekerî/: ناو. جاڕزی؛ وەڕەزی 🇮🇷 پکری

**پەکی**[١] / pekî/: ئاوەڵناو. زۆر؛ زاف؛ گەلەک 🇮🇷 بسیار

**پەکی**[٢]: ئاوەڵکار. باش؛ چاک ‹پـەکی، بـا وابـێ› 🇮🇷 بسیار خوب

**پـەکین** / pekîn/: چـاوگ. ١. هەڵـدێران؛ هەڵەوگەڕیان ٢. تـرازان؛ لـە جـێ دەرچـوون ٣. پسیان؛ ڕەوین 🇮🇷 ١. واژگون شدن ٢. از جا در رفتن ٣. گُسستن

**پەگر** / pegir/: ناو. ١. تلفی بنی تراو ٢. خلـتەی کانزای تواو 🇮🇷 ١. دُردی ٢. تەنشین فلز گُداختە

**پەگڕ** / pegiř/: ناو. گەمـڕە؛ سـەنیری وشـک و ڕەقهەڵگەڕاو 🇮🇷 سرگین خُشک و سِفت

**پـەل**[١] / pel/: نـاو. ١. شـەپۆل؛ کۆمـا ئـاوی بەرزەوەبووی بزۆک ٢. *[پلا]* پیل؛ لاق و دەست؛ دەست و باسک ‹لە چوارپەلـان هەر گـوێی سـاغە!؛ بنەوە لە پەلـی بیهێنـە!› ٣. باڵی باڵـندە ‹کەوەکـە پەلـی پـرووزاوە› ٤. دەسـتە؛ پـۆل ‹پـەلێ مـراوی بیرەدا چـوو› ٥. لقـی دار ٦. درکـی دار ٧. درک؛ چقـڵ؛ دروو ‹پـەلێکم لـە قـاچ راچـوو› ٨. سـکڵ؛ پۆلوو؛ پەنگر؛ پەن ‹ئاهێ بێگاف ژ دل تێن مە ژ بێ تا د جگەر/ بەس تە بێ فەیدە نەسیحەت کە! مە دل

بوویە پەلەک «مەلای جزیری»› ٩. شیوەڵە؛ دەرە؛ دۆڵی تەنگەبەر ١٠. قلیشەدار ‹دارەکە پەلێکی لێ بۆتەوە› ١١. گەڵا؛ بەڵگ؛ پەلک ١٢. پارچە؛ پاژ ‹پەلێکم بۆ لەو نانە بکەوە!› ١٣. *[مەجاز]* تیرەیەک لە هۆز و عاشیرەت ١٤. براوی وەک نووکە قەڵەم ١٥. پل؛ قامک؛ ئەنگووس ☰ ١. موج ٢. هر یک از دست یا پاها ٣. بال پرنده ۴. تیم؛ گروه ۵. شاخه ۶ خار درختی ٧. خار ٨ اخگر ٩. درّەی تنگ و باریک ١٠. تراشەی چوب ١١. برگ ١٢. جزء؛ بخش ١٣. شاخەای از قبیله ١۴. تراشِ مانند نُک قلم ١۵. انگشت

⊡ **پەڵ بوون**: وە پەلە کەوتن لە ڕۆیشتن و لە باقی جیا بوونەوە ‹ئەوە بۆ کوێ پەڵ بوو؟› ☰ با شتاب رفتن و از بقیه جدا شُدن

**پەڵ کردن**: ١. پەڕاندن بە تیغ ٢. خوارەوخوار تاشین؛ پێڵە تاشین ‹بە چەقۆ قامکی خۆی پەڵ کردووە› ☰ ١. پی کردن ٢. مورب تراشیدن

**پەڵ کوتان**: ١. دەست کوتان؛ لە تاریکیدا دەست گێڕان ‹وەک کوێران هەر پەلم دەکوتا و هیچم بە دەستەوە نەدەهات› ٢. *[مەجاز]* خۆ لە دار و بەرد دان ‹هەرچی پەلی کوتا هیچی پێ نەبرا!› ☰ ١. جُستن کورانە ٢. بە هر دری زدن

**پەڵ گرتن**: دەست گرتن؛ یاریدە دان ‹نە حەرفی مەکتەبێکت خوێند نە ئوستادێ پەلی گرتی/ سیرف بەرزیی زەکا ئەم سەنعەتەی فێر کرد بە شمشاڵت «گۆران»› ☰ دست کسی را گرفتن

**پەڵ هاویشتن**: ☜ **پەڵ هەڵدان**

**پەڵ هەڵخستن**: پەڕ هەڵخستن؛ بڵاو بوونەوەی مەڕ و ماڵات بە کێودا بۆ لەوەڕین ☰ پخش شدن گوسفندان برای چرا

**پەڵ هەڵدان**: پەڵ هاویشتن؛ لق‌وپۆ دەرکردن؛ هەراش بوونی دار و گیا ☰ رشد کردن گیاه

**پەڵ**[٢]: ئاوەڵناو. ١. بەرانبەری قووڵ ‹ئەم دەورییە پەلە، بۆ چێشت تێ کردن نابێ› ٢. ناتەواو؛ نیوەچڵ ☰ ١. کم‌عمق ٢. ناتمام

⊡ **پەڵ بوون**: ١. قووڵ نەبوون ٢. بەربوونەوە؛ سەرەوخوار بوون ‹داوێن‌تەڕ و شەرمەزار و سەرشۆڕ/ بێ‌ئابڕوو پەڵ دەبن بەرەو گۆڕ «هەژار، *مەم و زین*»› ☰ ١. گود نبودن ٢. ول شدن

**پەڵ**[٣]: پێرۆ. ← **کەڵ‌وپەڵ**

**پەلاپیسکە** / pelapîske/: ناو. پەلەپیسکە؛ کرمی ناو گەڵای گیا ☰ نوعی کرم آفت گیاه

**پەلاتە** / pelate/: ئاوەڵناو. ١. سەقەت؛ عەیبدار ٢. *[کینایە]* دواکەوتە لە باری هزرەوە ☰ ١. معیوب ٢. عقب‌ماندەی ذهنی

**پەلاتیقە** / pelatîqe/: ناو. هەوڵ؛ تەقالا ☰ سعی و کوشش

**پەلاختن** / pelaxtin/: چاوگ. ١. پلیخاندنەوە ٢. جنێو دان ☰ ١. لە کردن ٢. ناسزا گفتن

**پەلارە** / pelare/: ناو. هێشوو؛ هۆشە ☰ خوشەی انگور

**پەلاستیک** / pelastîk/: ☜ **پلاستیک**

**پەلاک** / pelak/: ☜ **پلاک**

**پەلامار** / pelamar/: ناو. پەلەمار؛ هێرش؛ هەڵمەت؛ گەمارۆ ‹ئەگەر مردم لە سەر قەبرم بنووسن تۆ خوا یاران/ شەهیدی عیشقی میللەت بووی کەچی نەتدی پەلاماری «قانع»› ☰ یورش؛ تک

⊡ **پەلامار بردن/ دان**: هەڵمەت بردن؛ هێرش کردن ‹سەگ پەلامارت بداتێ، دانیشی ڕزگا ئەبی/ هەر کەسێ هەڵمەت لە کەوتوو دا، لە سەگ زۆر کەمترە «قانع»› ☰ یورش بردن

**پەلاماردەر** / pelamarder/: ئاوەڵناو. هاژۆتکار؛ هاژۆتیار؛ ورووژم‌کەر ☰ مُهاجم

**پەلامیتکە** / pelamîtke/: ناو. پەلەپیتکە؛ پلتۆک ☰ تلنگر

**پەلان** / pelan/: چاوگ. نەوازش کران ☰ نوازش

شدن

**پەلاندن** / pelandin/: چاوگ. حاواندنەوە؛ ناز دان ≡ نوازش کردن

**پەلاو** / pelaw/: ناو. ئاوی بەرین و کەمقووڵ ≡ آب پهن و کم‌عمق

**پەل . پەل** / pel pel/: ئاوەڵناو. پارچە ــ پارچە؛ لەت ـ لەت ‹بە پەل ـ پەل کردنی سبحەی ئەگەر ببۆایە باوەڕیان/ دەبوو قەت بەم حەدە نەبوایە بۆ دنیا پەلەی مەخلووق «مەحوی»›. هەروەها: **پەل ـ پەل بوون؛ پەل ـ پەل کردن** ≡ قطعه ـ قطعه

**پەلپەلیسک** / pelpelîsk/: ناو. پەپوولە ≡ پروانه

**پەلت** / pelt/: ☜ **پەلك**

**پەلتەک** / peltek/: ناو. بڕکەی بێستان ≡ بوتەی پالیزی

**پەلتین** / peltîn/: چاوگ. خۆگرتن؛ توند بوون دوای شلی ≡ سفت شدن

**پەلچڤاندن** / pelçivandin/: چاوگ. ١. پلیخاندنەوە؛ داشێلان ٢. جنێو دان ≡ ١. له کردن ٢. دُشنام دادن

**پەلچڤین** / pelçivîn/: چاوگ. پلیخانەوە؛ فلیقانەوە ≡ له شدن

**پەلچم** / pelçim/: ناو. گزرەی گەلادار کە بۆ زستان هەڵدەگیرێ ≡ گیاه پرس شده

**پەلچمۆک** / pelçimok/: ناو. شەمشەمەکوێرە ≡ خُفاش

**پەلخان** / pelxan/: چاوگ. پەلخین؛ پان و فلچ بوونەوە ≡ له شدن

**پەلخاندن** / pelxandin/: چاوگ. پان و پلیخ کردنەوە ≡ له کردن

**پەلخوڕ** / pelxuř/: ناو. جۆی کوتراو بۆ مەڕ و مالات ≡ جو کوبیده، خوراک دام

**پەلخین** / pelxîn/: ☜ **پەلخان**

**پەلساندن** / pelsandin/: چاوگ. هاڕین؛ ورد و خاش کردن ≡ خُرد و خاش کردن

**پەلسین** / pelsîn/: چاوگ. هاڕدران؛ ورد و خاش بوون ≡ خُرد و خاش شدن

**پەلشاندن** / pelşandin/: چاوگ. کاول کردن؛ وێران کردن ≡ ویران کردن

**پەلشتی** / pelîştî/: ئاوەڵناو. بێکارە؛ خوێڕی ≡ بیکاره

**پەلشقە** / pelîşqe/: ئاوەڵناو. ناقایم؛ شلوشەوێق ≡ شُل و ول

**پەلقوت** / pelqut/: ئاوەڵناو. نیوە کوتراو ≡ نیم‌کوب

**پەلقەوی** / pelqewî/: ئاوەڵناو. هەستیگەشتک؛ پێشە ئەستوور ≡ درشت‌استخوان

**پەلک** / pel(i)k/: ناو. ١. کەزی هۆنراو؛ زولفی تەنراو ٢. گەڵا ‹ڕێحانە ڕەشەی پەلک پەلپینە/ من بۆ تۆ نابم، بە خەو بمبینە «فولکلۆر»› ٣. لق؛ لکە دار ‹گۆڕم لە پەنا ڕەزان بکۆڵن، ڕەزوان/ هەڵبەستێ لە پەلک و داری مێو تابووتم «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ٤. پێڵووی چاو ≡ ١. زُلف بافته ٢. برگ ٣. شاخه ٤. پلک چشم

**پەلکدار** / pel(i)kdar/: ناو. جەغزینگ؛ پەرگار ≡ پرگار

**پەلکڕێحان** / pel(i)křêĥan/: ناو. جۆرێ کراسی قەدیمی ژنانە ≡ نوعی پیراهن زنانه

**پەلکە** / pelke/: ناو. ١. پرچ و قژی هۆنراو ٢. *[مەجاز]* هەر شتێکی وەکوو پەلکە هۆنراو ‹پەلکەزێڕینە› ≡ ١. موی بافته ٢. هر چیز مانند زُلف بافته

**پەلکەڕەنگینە** / pelkeřengîne/: ☜ **پەلکەزێڕینە**

**پەلکەزێڕینە** / pelkezêřîne/: ناو. پەلکەڕەنگینە؛ کۆلکەزێڕینە ≡ رنگین‌کمان

**پەلکەمێو** / pelkêmêw/: ناو. بەرگەمێو؛ گەلامێو؛ ئاپراخ ≡ برگ مو

**پەلکین** / pelkîn/: چاوگ. ١. بەگوڕ کار کردن ٢.

گاولکێ کردن ☰ ١. با انرژی کار کردن ٢. چهار دست و پا رفتن

**پەلکێش** / pelkêş/: ناو. ١. چاوساخی کوێر؛ دەس‌کێشی کوێر ٢. پنگرگر؛ مقاش؛ مەقاش؛ ماشە ☰ ١. عصاکش ٢. انبُر

**پەلگر** / pelgir/: ناو. پەلگرک؛ ماشە؛ مقاش ☰ انبُر

**پەلگرک** / pelgirik/: ☜ **پەلگر**

**پەل‌وپۆ** / pel û po/: ناو. ١. پەڕ و باڵ ‹لە ناو هەڵکشاوە پەل‌وپۆی باڵدار/ رەنج ئەدا فرەفڕ ناگاتە سەر دار «گۆران»› ٢. *[کینایە]* لق‌وپۆ ‹داری خەیلێ پیر، بێ پرژ و بێ‌باڵ/ پەل‌وپۆ وەریو، بە وێنەی عەودال «قانع»› ٣. *[مەجاز]* هێز و توان ‹لە پەل‌وپۆ کەوتووم› ٤. *[مەجاز]* تەقالا؛ کۆشش ‹زۆری پەل‌وپۆ کرد و هیچی پێ نەکرا› ☰ ١. پر و بال ٢. شاخ و برگ ٣. تاب و توان ۴. کوشش

**پەلوەچ** / pelweç/: ناو. خەڵف؛ چرۆ؛ لکی ناسکی تازە سەرهەڵداوی گیا ‹هەر شەو شەماڵ تی، دەی لە دەماخەد/ وە شەونم شووری پەلوەچ و شاخەد «سەعید عیبادەتیان»› ☰ جوانەی درخت

**پەلۆخ** / pelox/: ئاوەڵناو. ١. داگرساو؛ گڕتێچوو؛ گڕگرتوو ٢. داڕزاو لە سووتان ☰ ١. مُشتعل ٢. جزغالە

**پەلوخ** / pelûx/: ناو. سکڵ؛ پۆلووی گەش ☰ اخگر

**پەلووژە** / pelûje/: ☜ **پێلۆژە**

**پەلووک** / pelûk/: ناو. گیای ئالەکۆک ☰ گیاهی با ریشەی خوراکی

**پەلوول** / pelûl/: ناو. ١. خۆڵەمێش؛ بووڵ ٢. پەلی؛ ئارخافک؛ خاوورۆن ٣. حەلوا؛ هەڵوا ☰ ١. خاکستر ٢. خاگینە ٣. حلوا

**پەلە** / pele/: ناو. ١. لەز؛ عەجەلە ‹شاعیر بۆ پارە هیچ ناکا پەلە/ ئارەزووی شاعیر هەر بەرزیی گەلە «قانع»›. هەروەها: **پەلە بوون**؛ **پەلە کردن** ٢. پاڵداوین؛ بناری کێو؛ دامێنی چیا ٣. داوێن؛ دامێن ٤. پەڕ؛ پەڕە؛ وەرەق ٥. تای تەرازوو ☰ ١. عجلە؛ شتاب ٢. دامنەی کوە ٣. دامن ۴. لا؛ ورق ٥. کفّەی ترازو

**پەلەبزووت** / peleb(i)zût/: ناو. ١. سەلکە بزووت؛ سەرەسووت؛ دارەدەست و تێلای سەر سووتاو ٢. دەست‌بزێوی ☰ ١. چوبدست سر سوختە ٢. دست‌درازی

**پەلەپچڕ** / pelep(i)çiř/: ئاوەڵکار. پەلەپچڕکێ؛ پەلەپچڕێ؛ پەلەپچوڕکێ؛ پەلەپڕووزکێ؛ پەلەپڕووزە؛ پەلەپڕووزێ؛ پەلەپرووسکە؛ پەلەپرووسکێ؛ زۆر بە زەحمەت و بە پەلە ☰ شتابان

**پەلەپچڕکێ** / pelep(i)çiřkê/: ☜ **پەلەپچڕ**

**پەلەپچڕێ** / pelepiç(i)řê/: ☜ **پەلەپچڕ**

**پەلەپچوڕکێ** / pelep(i)çuřkê/: ☜ **پەلەپچڕ**

**پەلەپڕووزکێ** / pelep(i)řûzkê/: ☜ **پەلەپچڕ**

**پەلەپڕووزە** / pelep(i)řûze/: ☜ **پەلەپچڕ**

**پەلەپڕووزەیی** / pelep(i)řûzeyî/: ☜ **پەلەپڕووزێ**

**پەلەپڕووزێ** / pelep(i)řûzê/: ☜ **پەلەپچڕ**

**پەلەپرووسکە** / pelep(i)řûske/: ☜ **پەلەپچڕ**

**پەلەپرووسکێ** / pelep(i)řûskê/: ☜ **پەلەپچڕ**

**پەلەپسکێ** / pelepiskê/: ناو. باڵەشۆڕە؛ نەخۆشییەکی مریشک ☰ نوعی بیماری مُرغ

**پەلەپڤە** / pelep(i)ve/: ئاوەڵناو. دووبارە بە ئاگرەوە نراو (بۆ نان) ☰ دوآتشە

**پەلەپەل**[1] / pelepel/: ناو. پەلە؛ لەز ‹ئەو هەمووە پەلەپەلە بۆ چییە؟› ☰ عجلە؛ شتاب

⊡ **پەلەپەل کردن**: پەلە کردن ‹لە ئاش بەجێ ماوە، لە ڕێگا پەلەپەل دەکا› ☰ عجلە کردن

**پەلەپەل**[2]: ئاوەڵناو. پەلە؛ لەز ‹حاشا لە کاری

پەلەپەل› 🇮🇷 با عجله

**پەلەپەل**[۲]: ئاوەڵکار. بەپەلە؛ بەلەز ‹پەلەپەل شتێکی گوت و ڕۆیشت!› 🇮🇷 باعجله

**پەلەپیتک / pelepîtik**/: ☜ **پەلەپیتکە**

**پەلەپیتکە / pelepîtke**/: نـاو. پەلـەپیتک: ١. پلتۆک؛ پتکە ٢. ئەو زیخەی بە پتکە هـاوێژراوە ٣. پێ؛ ماشە؛ ماشەک؛ قولاب‌ئاسـایەک لـە بـڕێ دەزگا (بەتایبەت چەک)دا کـە ئەگـەر بکێشـرێ دەزگاکە دەکەوێتـە کـار 🇮🇷 ١. تَلنگُر ٢. ریـگ بـا تلنگر پرت شده ٣. ماشه

**پەلەپیسکە / pelepîske**/: نـاو. مێشـوولەی تـۆی گەڵای دار 🇮🇷 پشەی آفت برگ

**پەلەتاتە / peletate**/: نـاو. کـرێوە؛ بـادەوە 🇮🇷 کولاک

**پەلەتک / peletik**/: ناو. پەتک؛ لەتـە گـوریس 🇮🇷 رسن پاره

**پەلەچەمک / peleçemk**/: نـاو. شـەوکوێرە؛ شەمشەمەکوێرە 🇮🇷 خُفاش

**پەلەخ**[۱] **/ pelex**/: ناو. ١. پاوان؛ کۆدە؛ لەوەڕگـەی قەدەغـە ٢. جـۆرێ تـووتنی ورد 🇮🇷 ١. مرتـع انحصاری ٢. نوعی توتون

**پەلەخ**[۲]: ئاوەڵناو. داتۆڵاو بە ئاگر 🇮🇷 سوخته و از هـم پاشیده

**پەلەخان / pelexan**/: چـاوگ. داڕزان؛ سـووتان و لە بەر یەک چوون 🇮🇷 جزغاله شدن

**پەلەخاندن / pelexandin**/: چـاوگ. داڕزانـدن؛ سووتاندن و لە بەر یەک بردن 🇮🇷 جزغاله کردن

**پەلەخۆر / pelexor**/: ناو. ژیلەمۆی هێشـتا گـەرم 🇮🇷 خاکستر گرم

**پەلەدین / peledîn**/: ئاوەڵناو. ١. نـەزان؛ نـەفام ٢. شێت؛ هەشقک 🇮🇷 ١. ابله ٢. دیوانه

**پەلەزێ / pelezê**/: ناو. گوڵاڵـە گـەزیزە 🇮🇷 زنبـق وحشی

**پەلەزێسک / pelezêsik**/: ناو. سوێسن؛ پـەلێزە 🇮🇷 سوسن

**پەلەژارە / pelejare**/: ناو. قشقەڵە؛ قەلەبازەڵـە 🇮🇷 زاغی

**پەلەسوانە / peles(i)wane**/: نـاو. لقـی داری گوێسوان 🇮🇷 چوب لبەی بام

**پەلەسۆ / peleso**/: ناو. گیایـەکی گـوڵ‌زەردە، زوو هەڵدەوەرێ 🇮🇷 گیاهی است

**پەلەسۆرک / pelesorik**/: ناو. گەڵای پاییز، پـێش زەرد بوون 🇮🇷 برگ پاییز قبل از ریختن

**پەلەسۆنک / pelesonik**/: ناو. بن‌گەڵا؛ دوو گەڵای بنەوەی تـووتن کـە دەوەرێ 🇮🇷 دو بـرگ انتهـایی توتون که می ریزند

**پەلەسور / pelesûr**/: ناو. گیای قومام 🇮🇷 **گورگیاه؛** سُنبُل هندی

**پەلەسی / pelesî**/: ناو. قوزەڵقورت؛ کرمی مێملی کۆئەندامی هەرسی مالات 🇮🇷 کپلک جگر نیشتری

**پەلەسیسە / pelesîse**/: نـاو. نەخۆشـی ڕەز کـە گەڵای سیس دەبن 🇮🇷 نوعی بیماری مو

**پەلەشت / peleşt**/: ئاوەڵناو. ١. پـیس و پـۆخڵ ٢. خوێـڕی و بێکـارە ٣. خۆنـەگرتوو 🇮🇷 ١. کثیـف ٢. بیکاره ٣. نیم‌بند

**پەلەشەکرۆک / peleşekrok**/: نـاو. نـاوەرۆکی سەلکی گیای کەرتەشی 🇮🇷 مغز پیاز خارشکر

**پەلەفرتکێ / pelefirtkê**/: ☜ **پەلەقاژێ**

**پەلەفرتە / pelefirte**/: ☜ **پەلەقاژێ**

**پەلەفرتێ / pelefirtê**/: ☜ **پەلەقاژێ**

**پەلەقاژە / peleqaje**/: ☜ **پەلەقاژێ**

**پەلەقاژێ / peleqajê**/: ناو. پەلەقاژە؛ پەلەفرتکێ؛ پەلەفرتە؛ پەلەفرتێ: ١. هەوڵ و تەقالای یـەکجار زۆر ‹بە پەلەقاژێ گوڵی هێنا دەسـت/ هاویشـتی بـۆ لای کیـژی دیدەمەسـت «هـێمن»› ٢. پەلەفرتـە؛ پەلـەفرتکێ؛ پەلـەفرتێ؛ کـاری دەسـت و لاق

جووڵاندنەوە بۆ ڕزگار بوون لە چۆرتم ☰ ١. تلاش ٢. مذبوحانه

**پەلەک / pelek/**: ناو. جووڵە ☰ حرکت

▣ **پەلەک بڕیان**: جووڵە لێبڕان ☰ از حرکت افتادن

**پەلەکانە / pelekane/**: ☜ **پلیکان ـ١**

**پەلەکوتێ / pelekutê/**: ناو. کاری پەل کوتان ☰ عمل دست و پا زدن

**پەلەکێش / pelekêş/**: ناو. ١. پەلەپیتکە؛ پەلگر؛ ماشە ٢. کاری پێل گرتن و ڕاکێشان بە زۆر ‹پەلەکێشیان کرد و بردیان› ☰ ١. ماشه ٢. عملِ به زور کشیدن

**پەلەمار / pelemar/**: ☜ **پەلامار**

**پەلەمریشکە / pelem(i)rîşke/**: ناو. مرۆچانە؛ گز- گز ☰ مور ـ مور

**پەلەموور / pelemûr/**: ناو. خۆڵەمێش؛ خۆڵەکەوە؛ بووڵ؛ خۆڵی ☰ خاکستر

**پەلەندار / pelendar/**: ناو. پلار: ١. داردەستێ کە بۆ هاویشتن دەبێ ٢. کاری داردەست هاویشتن ☰ ١. تکه چوب ٢. عمل چوبدست انداختن

**پەلەنگ / peleng/**: ☜ **پلنگ**[1]

**پەلەوان / pelewan/**: ☜ **پاڵەوان**

**پەلەور / pelewir/**: ☜ **پەلەوەر**

**پەلەورگ / pelewirg/**: ناو. لەتەورگ ☰ تکه شکمبه

**پەلەوشە / pelewşe/**: ناو. مەریەم؛ مریەم؛ گوڵەپووران؛ گوڵەداماگ ☰ مریم

**پەلەوەر / pelewer/**: ناو. مەل؛ پەلەور؛ باڵدار؛ فڕندە ☰ پرنده

**پەلهەوان / pelhewan/**: ناو. تەنافباز؛ داربـاز ☰ طنابباز

**پەلیسە / pelîse/**: ناو. تالان؛ پوور؛ پووڕ ☰ چپاول

**پەلیسیاوشان / pelîs(i)yaweşan/**: ناو. قەیتەران ☰ پرسیاوشان

**پەلیشاندن / pelîşandin/**: چاوگ. پەرێشان کردن ☰ پریشان کردن

**پەلیشین / pelîşîn/**: چاوگ. پەرێشان بوون ☰ پریشان شدن

**پەلێک / pelêk/**: ناو. ١. چێشتی زۆر کوڵاوی لێک‌هاڵاو ٢. پارچەی پرچ‌پێچ ☰ ١. آش زیادی پخته‌ی در هم آمیخته ٢. زُلفبند

**پەڵ / peł/**: ناو. بەرد یان سندەی گەورە بۆ هاویشتن ☰ سنگ یا کلوخ برای انداختن

▣ **پەڵ خستنە دار**: [مەجاز] بەختی خۆ تاقی کردنەوە ☰ شانس خود را آزمودن

**پەڵاس / pełas/**: ناو. ١. بەڕە؛ بەڕەکۆن ‹ئەو کەی نە جای خەز پەڵاسش پۆشان/ کەی چوون قەیس پەی تۆ زۆخاوش نۆشان «خانای قوبادی»› ٢. کوێن؛ پارچەی ڕەشماڵ ٣. بۆخی سەر زار ☰ ١. پلاس ٢. پارچه‌ی سیاه‌چادر ٣. بارِ زبان

▣ **پەڵاسی دەم**: ئەو بۆخە سپییەی دەکەوێتە سەر زمانی نەخۆش ☰ بارِ زبان بیمار

**پەڵاش / pełaş/**: ناو. پووش؛ وشکەگیا ☰ خاشاک

**پەڵان / pełan/**: ناو. ئێسک؛ هەستێ؛ ئیسقان؛ پێشە ☰ استخوان

**پەڵاوی / peławî/**: ئاوەڵناو. پلپلی؛ لەکەدار؛ لەکەین؛ بەپەڵە ☰ لکّه‌دار

**پەڵپ / pełp/**: ناو. بیانوو؛ بەهانە؛ گرنە؛ گڕوو ☰ بهانه

▣ **پەڵپ پێگرتن**: بیانوو گرتن؛ کێشە تێ‌هاڵاندن؛ گڕوو لێ‌گرتن ☰ بهانه‌تراشی کردن

**پەڵپ گرتن**: بیانوو گرتن؛ بەهانە دۆزینەوە؛ گڕوو لە کارێ گرتن ☰ بهانه گرفتن

**پەڵپگر / pełpgir/**: ئاوەڵناو. پیلەگیر؛ بیانووگر؛ لەچەر؛ وڕکاوی ☰ بهانه‌گیر

**پەڵپواز / pełpwaz/**: ئاوەڵناو. بەپێچەڵ؛ گرنەگر؛ بەهانەگیر ☰ بهانه‌جو

**پەڵپەلان** / pełpełan/: ناو. شەڕەبەرد ≡ سنگ برای هم انداختن

**پەڵپین** / pełpîn/: ناو. ١. نووشتە و دووکەڵی ئەسپەندەر بۆ چاوزار ٢. ☜ پەڵپینە ≡ ١. تعویذ و دود سپند برای چشم زخم ٢. ☜ پەڵپینە

**پەڵپینە** / pełpîne/: ناو. پەرپینە؛ پەڵپین؛ پەرەپەلیک؛ پارپارە؛ پرپرە؛ پرپریک؛ پرپیلک؛ پیرپیلیک؛ پەرەپیلیک؛ ددان تیژکەرە؛ ڕووەکێکی گەڵا و لاسک گۆشتنە، لە نێو بێستانان زۆرتر وەک گیابژار دەڕوێ، بەڵام دەخورێ و چێشتی لێ دروست دەکەن ≡ گیاه خُرفه

**پەڵت** / pełt/: ناو. دۆخی زمان شکان؛ توانای قسە کردن لێ بڕان ≡ حالت زبان بستن

**پەڵتە** / pełte/: ناو. داری نێوان کۆڵەکە و بەردە کۆڵەکە ≡ چوب میان ستون و سنگِ ستون

**پەڵتەک** / pełtek/: ناو. نەخۆشی گەرووی ئاژاڵ ≡ گلودرد دام

**پەڵخ**[1] / pełx/: ناو. پەڵخە: ١. گوێلکی گامێش ٢. بەچکەبەراز ≡ ١. گوسالەی گاومیش ٢. بچەخوک

**پەڵخ**[2]: ئاوەڵناو. پان و فلچ ≡ لهیده

**پەڵخاشە** / pełxaşe/: ناو. وڕاوە؛ وڕینە ≡ هذیان

**پەڵخاندن** / pełxandin/: چاوگ. پان و فلچ کردنەوە ≡ له کردن

**پەڵخورد** / pełxurd/: ناو. پەڵخوڕ: ١. لەوەڕی ناو ورگی حەیوان کە هێشتا کاوێژ نەکراوەتەوە ٢. جۆی هاڕدراو کە دەدرێ بە ماڵات ≡ ١. علف نشخوار نشده ٢. جو خُرد شده برای حیوان

**پەڵخوڕ** / pełxuř/: ☜ پەڵخورد

**پەڵخە** / pełxe/: ناو. پاڵاخی چووک؛ گوێلکی گامێش ≡ گوسالەی گاومیش

**پەڵخی**[1] / pełxî/: ناو. کۆترەگایە ≡ کبوتر جنگلی

**پەڵخی**[2]: ئاوەڵناو. پان و فلچ کراو ≡ لە و لگدمال شده

**پەڵک** / pełk/: ناو. پەڵت؛ دارێکە لە تیرەی چناران ≡ درخت ترنگوت

**پەڵکەزێڕینە** / pełkezêřîne/: ☜ پەلکەڕەنگینە

**پەڵکەمێو** / pełkemêw/: ناو. بەرمێو؛ ئاپراخ؛ گەلامێو ≡ برگ مو

**پەڵگ** / pełg/: ناو. پێڵوو؛ پیلوو ≡ پلک چشم

**پەڵم** / pełm/: ناو. ١. بیانوو؛ پەڵپ ٢. ماس؛ با؛ پەنام؛ ئەستووری ≡ ١. بهانه ٢. آماس

**پەڵمان** / pełman/: چاوگ. پەڵمین؛ پەنەمین؛ ماسین؛ با کردن ≡ آماسیدن

**پەڵماو** / pełmaw/: ئاوەڵناو. ماسیو؛ ماسیگ؛ هەلامساو؛ پەنەماو؛ ستووربوو ≡ آماسیده

**پەڵمین** / pełmîn/: ☜ پەڵمان

**پەڵۆخ** / pełox/: ئاوەڵناو. ١. پلۆخ؛ پۆخڵ؛ پیس و چڵکن ‹ئەوە ئەو منداڵە بۆ وا پیس و پەڵۆخە؟› ٢. لێ دڕاو بە دار و بە دەست ≡ ١. کثیف ٢. کُتک خورده

**پەڵۆخان** / pełoxan/: چاوگ. پەڵۆخین؛ لێدانی توند و لەزەبر ≡ کُتک مُفصل زدن

**پەڵۆخین** / pełoxîn/: ☜ پەڵۆخان

**پەڵۆشە** / pełoşe/: ناو. ١. ڕیشووی گیایەکە لە بەر وشکی و زوو ئاگر گرتنی دەکرێتە پووشوو ‹پووش لە لای حەڵوایە حەتتا گەر پەڵۆشەی چنگ کەوێ/ بای ئەدا، لوولی ئەدا، قووتی ئەدا، مانەندی حووت! «شێخ ڕەزا»› ٢. گوێنی؛ گەون ≡ ١. ریشەی گیاهی که از آن پوده سازند ٢. گَوَن

**پەڵوو** / pełû/: ناو. پەڵوولە: ١. پرپۆڵە؛ ئارد و ئاوی تێکەڵ بۆ دانە جووچکە ٢. چێشتێکە وردە هەویر و کووزەڵەی تێ دەکەن ≡ ١. آرد آبزده برای جوجه ٢. اوماج

**پەڵوولە** / pełûle/: ☜ پەڵوو

**پەڵە**[1] / pełe/: ناو. ١. لەکە ‹تا بزانی چییە شوێنی مەردان/ خوێنی کوردانە پەڵەی سەر بەردان

«حەقیقی»› ٢. یەکەم بارانی تێر و تەسەلی پاییزان ٣. پارچەزەوی ٤. لەز و پەلە ☰ ١. لکّه ٢. اوّلین باران چشمگیر پاییزی ٣. قطعەی زمین ۴. شتاب

⊡ **پەڵە دان**: خووسان و باش تێراو بوونی زەوی بە یەکەم بارینی تێر و تەسەلی پاییزی ☰ سیراب شدن زمین با اوّلین باران مُفصل پاییزی

**پەڵە**[٢]: پێرۆ. ← **هەڵەوپەڵە**

**پەڵە ـ پەڵە** / pełe pełe/: ئاوەڵناو. ١. خاڵ ـ خاڵ؛ پنۆک ـ پنۆک ٢. پۆل ـ پۆل؛ گەواڵ ـ گەواڵ ٣. لەت ـ لەت ☰ ١. خالخالی ٢. دسته ـ دسته؛ گروه ـ گروه ٣. تکه ـ تکه

**پەڵەت** / pełet/: پێرۆ. ← **هەڵەتوپەڵەت**

**پەڵەخ** / pełex/: ناو. گیایەکە لە قۆپیدا دەڕوێ و وەک پووش وایە ☰ گیاهی است

**پەڵەفڕکێ** / pełefiřkê/: ناو. بەردەفڕکێ؛ کاری بەرد هاویشتن ☰ سنگپرانی

**پەڵەنگ** / pełeng/: ☜ **پڵنگ**[١]

**پەڵەهەور** / pełehewr/: ناو. پینە؛ گەواڵ؛ پینەهەور ☰ لکّەی ابر

**پەڵیت** / pełît/: پێرۆ. ← **هەڵیتوپەڵیت**

**پەم** / pem/: ☜ **پەمۆ**

**پەماو** / pemaw/: ناو. پاماو؛ کاری ساف کردنی دیواری گەچکاری کراو بە لۆکەی تەڕ ☰ کار صاف کردن گچکاری با پنبەی تر

**پەمبلۆکێ** / pembilokê/: ناو. دۆک؛ نەخۆشی ڕەز کە گەڵای سپی دەبێ ☰ سپیدک مَو

**پەمبۆ** / pembo/: ☜ **پەمۆ**

**پەمبۆدانە** / pembodane/: ☜ **پەمۆدانە**

**پەمبە** / pembe/: ☜ **پەمۆ**

**پەمبەیی**[١] / pembeyî/: ناو. گوڵی؛ چێرەیی؛ سوورەتی؛ ڕەنگی سووری کاڵ ☰ صورتی

**پەمبەیی**[٢]: ئاوەڵناو. گوڵی؛ چێرەیی؛ سوورەتی؛ بە ڕەنگی سووری کاڵ ☰ به رنگ صورتی

**پەمبی** / pembî/: ☜ **پەمۆ**

**پەمبیدانک** / pembîdanik/: ☜ **پەمۆدانە**

**پەمبیلۆک** / pembîlok/: ناو. گیایەکە ☰ گیاهی است

**پەمپە** / pempe/: ☜ **پەمۆ**

**پەمدەر** / pemder/: ناو. ترومپا؛ تورمپا ☰ تُلمبه

**پەمگ** / pemig/: ☜ **پەمۆ**

**پەمڵەپڕی** / pemłep(i)řî/: ئاوەڵناو. سەرپۆت؛ سەرسەری؛ سەرچڵ ☰ سطحی؛ سرسری

**پەمڵەپڕێ** / pemłep(i)řê/: ناو. ڕەشۆکی ☰ نوعی تفنگ

**پەموانە** / pem(i)wane/: ☜ **پەمۆدانە**

**پەمۆ** / pemo/: ناو. پەم؛ پەمە؛ پەمبۆ؛ پەمبە؛ پەنبۆ؛ پەمبی؛ پەموو؛ پەمپە؛ پەمگ؛ پەنبی؛ لۆکە ☰ پنبه

**پەمۆچن** / pemoçin/: ناو. لاکۆت ☰ پنبەچین

**پەمۆچینی** / pemoçînî/: ناو. لاکۆتی ☰ پنبەچینی

**پەمۆخ** / pemox/: ناو. هەودەڵ؛ تەپەدوور؛ تەپەدۆر؛ چێوپەمە؛ چووپەمە؛ چۆپەمە: ١. تۆکڵەی بڕێ داری وەک بەڕوو کە پاش وشک بوونەوە، نەرم و پیف دەبنەوە و سووک و کون‌ـکون هەڵدەگەڕن ٢. خرکەڵەیەک لەو چێوە کە بۆ سەرگرتنی بوتری دەبێ ☰ ١و٢. چوب‌پنبه

**پەمۆدانە** / pemodane/: ناو. پەمبۆدانە؛ پۆمبیدانک؛ پەموانە؛ پەمەتۆمە؛ پەمبیدانک؛ ناوکەپەمۆ؛ ناوکە لۆکە؛ دەنکە پەموو؛ دەنکی گیای پەمۆ ☰ پنبەدانه

**پەموو** / pemû/: ☜ **پەمۆ**

**پەمە** / peme/: ☜ **پەمۆ**

**پەمەتۆمە** / pemetome/: ☜ **پەمۆدانە**

**پەمەیی** / pemeyî/: ئاوەڵناو. ١. لە لۆکە؛ کۆڵەیی؛

دروستکراو لە پەموو ٢. بە ڕەنگی چێرەیــی ☰ ١. پنبەای ٢. صورتی

**پەمیان** / pem(i)yan/: چـاوگ. پەمین؛ پەنـەمان؛ ماسین؛ ئەستوور بوون ☰ آماسیدن

**پەمیاو** / pem(i)yaw/: ئاوەڵـناو. ماسـیو؛ پەنـەماو؛ هەڵمساو ☰ آماسیده

**پەمین** / pemîn/: ☜ **پەمیان**

**پەن** / pen/: نـاو. ١. پۆلوو؛ پەنگر؛ سکڵ ٢. پەنـد؛ دەرسی عیبرەت ‹وتیان: ئێمەی خۆپەسەن، خۆمان خۆمان کردە پەن/ هەتا وا لێک‌بلاو بین، ئەشێ سـەر بێ‌کلاو بین «هـەژار، *پێـنج‌ئەنگوسـت*»› ٣. *[مەجاز]* سـووکایەتی ☰ ١. اخگـر ٢. درس عبـرت ٣. بـی حُرمتی

⊡ **پەن پێدان**: ١. بەلا هاوردنە سـەردا ٢. *[کیایە]* ئەتک پێ‌کـردن ☰ ١. گرفتـار کـردن ٢. تجـاوز کردن

**پەن دان**: قۆماندن؛ کارێ هەڵـە ئـەنجام‌دان ☰ دستە گل بە آب دادن

**کردنە پەن**: ناو زڕاندن؛ ئابڕوو بردن ☰ آبرو بردن

**پەنا**[١] / pena/: ناو. ١. گۆشە؛ قوژبن ‹ئەوسا ئەبینی لـە هـەموو لایـەک/ هـەر چەنـد کەسـێکە و چۆتـە پەنایەک «بێکەس»› ٢. تەنیشت ‹بەڕەزا ئەڕۆی لـە پـەنا هـەردا/ بـای مەینـەت سـەری ئـەدا بـە بـەردا «پیرەمێرد»› ٣. هانا؛ ئـەوەی کـە دەبێتـە هـۆی ڕزگاری یان پەڕینەوە لە مەترسی ‹پەنام هەر تۆنی یەکتای بێ‌هەمتا/ وەی بەند زندان مـن بـووم ڕەهـا «ئەرکەوازی»› ٤. پەناگا؛ جێگەی حەوانەوە ‹سـەد کەلاوە و لاڕووخاو و چاڵ و چۆڵ بی، نیشـتمان!/ بـۆ گـەلی مـاڵ‌کـاول و بێچـارە هـەر جێگـەی پـەنای «ئاوات»› ☰ ١. کُنج ٢. کنار ٣. پناه ٤. پناهگاه

⊡ **پەنای بێدەنگ**: قروقـپ؛ فـەنای بـێ‌دەنـگ ☰ بازیِ خاموشی و سکوت

⊡ **پەنا (بۆ) بردن**: چوونە بەر داڵدە ‹شەل نەبوایـە ڕای ئەکرد/ بە قەلا پەنای ئەبرد «گۆران»› ☰ پنـاه بردن

**پەنا دان**: حاواندنەوە ☰ پناه دادن

**پەنا گرتن**: ١. خۆ وەشارتن ‹کێ پەنای گرت لـە ڕەهێڵەی تۆپـان/ چەندسـەکەت بـوون عـەرەب و جـاش تۆپـان «مـەحوی»› ٢. پـەنا بـردن ‹لـە مەکری ئەم عەجووزە و سیحری دێوی نەفس ئەمن مەحوی/ پەنا دەگرم بە زاتی ئەقدەسـی بێچـوونی نادیوە «مەحوی»› ٣. درەنگ هەڵاتنی مانگ لە شەوی پازدەهەمـدا ☰ ١. پنهـان شـدن ٢. پنـاه بردن ٣. تأخیر ظهور ماه در شب پانزدهم

**پـەنا هێنـان**: هاتنــە بــەر داڵــدە؛ پارێزگــاری خواستن ☰ پناه آوردن

**پـەنا**[٢]: ئاوەڵـناو. ١. خەڵــوەت؛ بــێ‌مشــەکەر ٢. وەشارتی ☰ ١. خلوت؛ دِنج ٢. پنهان

**پەنا**[٣]: ئامراز. پەنای؛ لە پەنا؛ لە پەنای؛ تەنیشت؛ لە تەنیشت؛ لە تەنیشتی ‹پەنا دیـوار؛ پـەنا گـوێ› ☰ دمِ؛ بغلِ؛ کنارِ

**پەنابا** / penaba/: ناو. ١. باپـەنا؛ شـوێنێ کـە بـا نایگرێتـەوە ٢. پـەنابات؛ پـەناباد؛ دە شـایی؛ نیـو قەران؛ پارەیەکی کۆنی ئێرانی کـە لـە پـەنابادی شووش لێ‌دەدرا ☰ ١. بادپناه ٢. نیم ریال ایرانی

**پەنابات** / penabat/: ☜ **پەنابا-٢**

**پەناباد** / penabad/: ☜ **پەنابا-٢**

**پەنابردە** / penabirde/: ناو. ژێربال ☰ پناهندە

**پەنابـەخوا** / penabex(i)wa/: سارستە. خواتۆبـە؛ دوعایەک بۆ خۆ پارازتن لە هەڵە و بەلا دەگوترێ ‹پەنابەخوا لە بـەزمی جادوییـدا/ لـە سـاقی چـاوی و ساقی بلووری! «بێخود»› ☰ پناە بر خدا

**پەنابـەر** / penaber/: نـاو. پــەناهێناو؛ دەخیــل؛ دەغیل؛ لاجە؛ داڵدەخواز؛ گیانلەبەرێ کـە لـە بـەر مەترسی پەنا دەباتە بەر کەسـێ یـان شـوێنێک. هەروەها: **پەنابەری** ☰ پناهندە

**پەناپەسیو / penapesîw**/: ☜ **پەناوپەسێو**

**پەنادەر / penader**/: ناو. ئەوەی پەنا دەدا و پەنای بۆ دەبەن ‹کەس نایەتە ڕیزی سەروەری مە/ بێ ئەو نییە کەس پەنادەری مە «هەژار، مەم و زین»› ☰ پناەدهندە

**پەنار / penar**/: ناو. چاوکە؛ سەرچاوە ☰ چشمە

**پەناڤ / penav**/: ناو. نەرمانی؛ گۆشتەی زەوی ☰ زمین نرم و بی‌سنگ

**پەناگا / penaga**/: ناو. شوێنی خۆ تێدا حەشاردان ‹ئەشکەوتێ نەچێ لە بیرم/ پەناگا بوو بۆ باپیرم «هێمن»› ☰ پناهگاە

**پەناگر / penagir**/: ناوەڵناو. لابا؛ باپەنا ☰ بادنگیر

**پەناگرتوو / penagirtû**/: ناوەڵناو. ١. خۆ وەشارتوو ٢. دۆخی مانگ دوای شەوی چاردە ☰ ١. پنهان شدە ٢. حالت ماە بعد از شب چهاردهم

**پەناگوێ / penag(i)wê**/: ناو. بناگوێ؛ پەنای گوێچکە ☰ بناگوش

**پەناگە / penage**/: ناو. پەنەگا؛ هالا؛ دالدە ☰ پناهگاە

**پەنام[1] / penam**/: ناو. ماس؛ با؛ ئەستووری؛ هەڵمساوی؛ دۆخ یان ڕەوتی ماسین ☰ آماس

**پەنام[2]**: ناوەڵناو. پێوار؛ نادیار؛ نەدیار ☰ پنهان

**پەنامان / penaman**/: ناو. نادیارییەکان؛ بەرپێواران ☰ ناپیداها

**پەنامگا / penamga**/: ناو. حەشارگا؛ حەشارگە؛ شوێنی خۆ شاردنەوە ☰ مخفیگاە

**پەنامەکی[1] / penamekî**/: ناوەڵناو. پەنهانی؛ نهێنی؛ بە دزییەوە ‹کاری پەنامەکی› ☰ مخفیانە

**پەنامەکی[2]**: ناوەڵکار. پەنهانی؛ بە نهێنی؛ بە دزییەوە ‹پەنامەکی دواندم› ☰ بە طور مخفیانە

**پەناوپەسیو / penawpesîw**/: ☜ **پەناوپەسێو**

**پەناوپەسێو / penawpesêw**/: ناو. پەناپەسیو؛ پەناوپەسیو؛ گۆشە و قوژبنی نادیاری ☰ گوشەی دنج

**پەناهەندە / penahende**/: ناو. پەنابەر؛ کەسێ کە پەنا بە کەسێ یان شوێنێک دەبا ☰ پناهندە

**پەناهێناو / penahênaw**/: ☜ **پەنابەر**

**پەنای / penay**/: ئامراز. لە پەنای؛ لە پاڵ؛ پاڵی؛ کنی ☰ بغلِ؛ کنارِ

**پەنبۆ / penbo**/: ☜ **پەمۆ**

**پەنبی / penbî**/: ☜ **پەمۆ**

**پەنج[1] / penc**/: ☜ **پێنج[1]**

**پەنج[2]**: ناوەڵناو. ١. ☜ **پێنج[2]** ٢. سڕ؛ بێ‌حەس ☰ ١. ☜ **پێنج[2]** ٢. بی‌حس

⊡ **پەنج کردن**: تەزاندن؛ سڕ کردن ☰ بی‌حس کردن

**پەنجا[1] / penca**/: ناو. پێنجی؛ چل و دە؛ ژمارەی دوای چل و نۆ، بەر لە پەنجا و یەک ☰ پنجاە

**پەنجا[2]**: ناوەڵناو. پێنجی: ١. دانەیەک زۆرتر لە چل‌ونۆ ‹پەنجا کەس› ٢. پەنجایەمین؛ پەنجاهەم؛ پەنجایەم ☰ ١و٢. پنجاە

**پەنجاهوم / pencahum**/: ☜ **پەنجاهەم**

**پەنجاهەم / pencahem**/: ناوەڵناو. پەنجایەم؛ پەنجاهوم؛ بە ڕیز و پلەی پەنجاوە ☰ پنجاهم

**پەنجاهەمی / pencahemî**/: جێناو. پەنجایەمی؛ ئەوەی کە لە ڕیز و پلەی پەنجاهەمدایە ☰ پنجاهمی

**پەنجاهەمین / pencahemîn**/: ناوەڵناو. پەنجاهەم؛ بە ڕیز، پلە یان جێگەی پەنجاوە ☰ پنجاهمین

**پەنجایەم / pencayem**/: ☜ **پەنجاهەم**

**پەنجایەمی / pencayemî**/: ☜ **پەنجاهەمی**

**پەنجایەمین / pencayemîn**/: ☜ **پەنجا[2]**

**پەنجایی / pencayî**/: ناو. مەنگەڵە؛ پارەی پەنجا فلسی؛ یەک‌بیستەمی دیناری عیراقی ☰ یک درهم عراقی

**پەنجم / pencim**/: ☜ **پێنجەم**

**پەنجنین** / pencinîn/: چاوگ. پەڕاندنی لکـی دار ☰ هَرَس کردن درخت

**پەنجوم** / pencum/: ☜ **پێنجەم**

**پەنجومی** / pencumî/: ☜ **پێنجەمی**

**پەنجومین** / pencumîn/: ☜ **پێنجەمین**

**پەنجۆلـە** / pencołe/: نـاو. دەسـت و پەنجـەی چکۆلە ☰ پنجەی نازک و کوچک

**پەنجە** / pence/: ناو. ١. دەست؛ لەپی دەست بـە هەر پێنج ئەنگوستەوە ٢. ئەنگوسـت؛ ئـەنگووس؛ قامک؛ تلی ‹وەنەوشەم دەچنی پەنجەم دا لە گـوڵ/ شەوگارم شەق کرد، نەگەییم بـە دڵ «فولکلـۆر»› ٣. چـڕنووکی دڕنـدە ‹هـەر دلـێ بـازی سـیفەت وێ سەیدێ تەیهوونک وەبێ/ فەرر و پـەروازێ هومـای و پەنجەیێ شنقار بت «مەلای جزیری»› ٤. جۆرێـک لە نەخشی تەونی بەڕە ☰ ١. دَست؛ کف دسـت بـا پنج انگشت ٢. انگشت ٣. چنگـال جـانور درنـده ۴. از طرحهای گلیم

▣ **پەنجە تووتە**: قامکە چکۆلە ☰ انگشت کوچک

**پەنجە کەڵە**: ☜ **پەنجەگەورە**

**پەنجـە گـەورە**: پەنجــە کەڵــە؛ سـپێ کـوژە؛ تلیامەزن؛ قامکە گەورە ☰ انگشت شست

⊡ **پەنجە دان**: ئاوقا بوون و لێوەستانەوە ‹خزمینـە مەدەن پەنجە لەگـەڵ عەشـرەتی جافـا/ مێروولـە نەچێ چاکە بە گژ قوولەیی قافـا «شـێخ ڕەزا»› ☰ ستیزیدن

**پەنجە بە دەما بردن**: [کینایە] پەشـیمان بـوون ☰ انگشت گزیدن

**پەنجە هەڵپێکان**: خەم و پەژارە داگرتن ☰ غُصه خوردن

**پەنجەچۆلەکە** / pençeçoleke/: ناو. پـێ چۆلەکـە؛ گیایەکی لاسک قاوەییە بە سەر ئەرزدا ڕادەکشێ ☰ گیاهی است

**پەنجـەداڵ** / pencedał/: نـاو. گـوڵ ئـارامیش؛ گیایەکـە بـۆ خـەنازیل و چاوقوولـکە کەڵـکی دەرمانی هەیە ☰ گیاه ماميران

**پەنجەر** / pencer/: ☜ **پەنجەرە**

**پەنجەرویسک** / penceruysk/: ☜ **پەنجەرۆك ـ٢**

**پەنجەرۆک** / pencerok/: ناو. ١. کاری ڕووشـاندن بـە نینـۆک ٢. پەنجەرویسـک؛ گیایەکـە ☰ ١. خراش با ناخن ٢. گیاهی است

**پەنجـەرە** / pencere/: نـاو. پـــەنجێرە؛ شـــباک؛ پەنجەر؛ دەروەچە ☰ پنجره

**پەنجەرەبچووک** / pencereb(i)çûk/: ناو. دەربیچە؛ کونەباچکە ☰ دریچە

**پەنجەسـەقەت** / penceseqet/: ئاوەڵـناو. کۆڵــە؛ قامکناتەواو ☰ ناقص از ناحیەی انگشت

**پەنجەشێر** / penceşêr/: ناو. شێرپەنجە؛ نەخۆشی سەرەتان ☰ سرطان

**پەنجەقازە** / penceqaze/: نـاو. گیایەکە زۆر بـەرز دەبێتەوە، قالۆری سپی هەیە و لە قـەراخ چـۆم و ئاوان دەڕوێ ☰ گُلپر

**پەنجـەقازی** / penceqazî/: نـاو. گاسـنێکە بـە تیغەی زۆرەوە، تەراکتۆر جووتی پـێ دەکـەن ☰ گاوآهن پنجەقازی

**پەنجـەکێش** / pencekêş/: نـاو. پەنجەکێشـی؛ جۆرێ کولێرە ☰ نوعی گردەنان

**پەنجەکێشی** / pencekêşî/: ☜ **پەنجەکێش**

**پەنجەگەورە** / pencegewre/: ☜ **پەنجە کەڵە**

**پەنجەگیا** / penceg(i)ya/: ناو. تاقەگوڵ؛ گوڵێکی پەڕ- پەڕە بۆ زیپکەی دەموچاو باشە ☰ گـل صـد تومانی

**پەنجەمۆر** / pencemor/: ناو. پەنجەومۆر؛ شـوێنی قامک لە ژێر نووسـراوەدا لـە جیـاتی واژۆ ☰ اثـر انگشت

**پەنجەمی** / pencemî/: ☜ **پێنجەمی**

**پەنجەوانـە** / pencewane/: نـاو. ١. چەرمێکــە

درویّنەوان لە قامکی دەکا ٢. ئەنگوستیلە ☰ ١. چرمی کە دروگر بە انگشت می‌کند ٢. انگشتر

**پەنجەومۆر** / pencewmor/: ☜ **پەنجەمۆر**

**پەنجیّرە** / pencêre/: ☜ **پەنجەرە**

**پەنچک** / pençik/: ناو. ١. قرتماغەی برین؛ پەترۆک؛ پەترۆ؛ پەترۆخە ٢. پاژ؛ پارچە ‹پەنچکە نانێکم دەیە!› ☰ ١. کبرەی زخم ٢. قطعە؛ تکە

**پەنچەر** / pençer/: ئاوەڵناو. ١. با تێدا نەماو لەبەر کون تێ بوون ٢. *[مەجاز]* پەکەر؛ جاڕز ☰ ١. پنچر ٢. پکر

**پەنچەرگیری** / pençergîrî/: ناو. ١. کاری ئاپاراتی ٢. دووکانی پەنچەرگیری ☰ ١و٢. پنچرگیری

**پەند** / pend/: ناو. پەن؛ پەنگ: ١. ئامۆژگاری ‹ئی سوخەن پەندەن جە قەدیم ئامان/ خواجان مەکێشان جەور غولامان «بێسارانی»› ٢. *[مەجاز]* ئەتک؛ سووکایەتی ☰ ١. پند؛ اندرز ٢. اهانت

⊡ **پەندی پێشینان**: قسەی نەستەق و ئەزموونی پیران ☰ امثال و حِکَم

⊡ **پەند پێدان**: ١. *[پلار]* ئامۆژگاری کردن ٢. بەلا و فریو بە سەردا هێنان ٣. ئەتک پێ کردن ☰ ١. درس عبرت دادن ٢. فریب دادن ٣. تجاوز کردن

**پەند دان**: ئامۆژگاری کردن ☰ نصیحت کردن

**پەندوەرگرتوو** / pendwergirtû/: ئاوەڵناو. چاوترسێن؛ تەمێبوو ☰ درس عبرت‌گرفتە

**پەندەمووس** / pendemûs/: ناو. پەنەمووس: ١. ماس؛ با ٢. تووکێکە واتا یاخوا بماسی ☰ ١. آماس ٢. نفرینی است

**پەندێر** / pendêr/: ناو. ئامۆژگاریکەر؛ وەعزدادەر ☰ اندرزگو

**پەنرێشک** / penrêş(i)k/: ☜ **پرمێشک**

**پەنرێشە** / penrêşe/: ☜ **پرمێشک**

**پەنژۆ** / penjo/: ناو. پێنج ڕۆژی سالپێوی ئێرانی کە لە ٣٦٠ ڕۆژیان زیاد کردووە تا ساڵ لەگەڵ وەرزدا ڕاست بێتەوە ☰ خَمسەی مُستَرَقە

**پەنژین** / penjîn/: ☜ **پونژین**

**پەنک** / penik/: ناو. ماشەرەبەن؛ کلافەبەنی گەورە ☰ کلاف ریس

**پەنکور** / penkûr/: ئاوەڵناو. شاراوە؛ قایم ☰ پنهان

⊡ **پەنکور کردن**: شاردنەوە ‹هەرچێک لە بەین خوەتان ئەیکەن، پەنکووری کەن!› ☰ پنهان کردن

**پەنکە** / penke/: ناو. واژەن ☰ پنکە

**پەنگ** / peng/: ناو. ١. پەرەنگ؛ پۆل؛ سکڵ ٢. پەند؛ دەرسی عیبرەت ‹چەن جارێ شەو ماڵی ئاغای دایە بەر تفەنگ/ دەغڵی سووتان، باغی بڕی، بۆ ئەتک، بۆ پەنگ «گۆران»› ٣. فریو؛ فێڵ؛ گزی ٤. ماشەرەبەن ٥. پۆنگ؛ چۆنیەتی داوێستان و کشانەوەی ئاو، دووکەڵ و ... لە شوێنێکی بەرتەنگ ☰ ١. اخگر ٢. درس عبرت ٣. فریب ۴. کلاف ریس ۵. انباشتگی مایع یا تراکم گاز در فضایی محدود

⊡ **پەنگ پێدان**: فریودان و سووکایەتی بە سەر هێنان ☰ فریب دادن و بی‌آبرو کردن

**پەنگ خواردنەوە**: ڕاوەستان و کشانەوەی ئاو، دووکەڵ و ئەوی بە کۆمەڵ دەبزوێ، لە شوێنێکی بەرتەنگ ‹تا تەواو ئەبێ ئەڵڵاهوو ئەکبەر/ پەنگ ئەخواتەوە لافاوی نوێژکەر «گۆران»› ☰ انباشته شدن مایع یا تراکم یافتن دود و گاز و امثال آن در فضایی محدود

**پەنگاندن** / pengandin/: چاوگ. ڕاوەستاندن؛ ڕاگرتن؛ ماتڵ کردن ☰ متوقف کردن

**پەنگاو** / pengaw/: ناو. پنگاو؛ پونگاو؛ پۆنگاو؛ ئاوی ڕاوەستاو ☰ آب جمع شده و راکد

**پەنگر** / pengir/: ناو. ١. سکڵ؛ پۆلوو ٢. ماشە؛ مقاش ☰ ١. اخگر؛ زغال افروختە ٢. انبُر

**پەنگرکێش** / pengirkêş/: ناو. پەنگڵ کێش: ١. بێلۆکەی ئاسنی سەرخوار کە سکلی پێدەردێنن ٢. ماشە؛ مقاش ☰ ١. اخگرکش ٢. انبُر

**پەنگرگر** / pengirgir/: ناو. مەقارە؛ مەقاشە؛ گازک؛ ماشک؛ ماشە ☰ مقّاش

**پەنگرەئەستێرە** / peng(i)re'estêre/: ناو. گوڵئەستێرە ☰ کرم شبتاب

**پەنگزین** / pengizîn/: چاوگ. هەڵبەزینەوە؛ بۆ هەر شتێ کە بە تەوژم بە زەویدا بدا و هەڵبەزێتەوە، وەک هەڵبەزینەوەی تۆپ ☰ برجَستن

**پەنگڵ** / pengił/: ناو. سکڵ؛ پۆلوو ☰ اخگر؛ زغال افروخته

**پەنگڵکێش** / pengiłkêş/: ☜ پەنگرکێش

**پەنگڵەمێش** / peng(i)łemêş/: ناوەڵناو. پشووسوار لە تووڕەیی ☰ دژم؛ غضبناک

**پەنگنای** / pengnay/: چاوگ. تەنگ پێهەڵچنین ☰ مُستأصل کردن

**پەنگوئن** / pengu'in/: ناو. پەنگۆوەن؛ چەشنێک پەلەوەری ناوچەی ساردی جەمسەری باشووری زەوینە ☰ پنگوئن

**پەنگۆوەن** / pengowen/: ☜ پەنگوئن

**پەنگهین** / pengihîn/: چاوگ. ١. بافیش کردن ٢. پەنگ خواردنەوە ☰ ١. تکبر ورزیدن ٢. انباشته شدن مایع یا تراکم یافتن گاز در فضایی محدود

**پەنگیای** / pengyay/: چاوگ. تێدامان؛ ڕێ پێنەمان ☰ مُستأصل شدن

**پەنم** / penim/: ناو. ماس؛ ئەستووری؛ چۆنیەتی ماسان؛ هەڵمسان ☰ آماس

**پەنمان** / peniman/: چاوگ. پەنەمان؛ پەنمین؛ پەنمیان؛ پەنەمین؛ پەنەمیان؛ ماسین؛ با کردن؛ ئەستوور بوون ☰ آماسیدن

**پەنماو** / penimaw/: ناوەڵناو. ماسیو؛ پەنەماو؛ پەنمیاگ؛ پەنەمیگ؛ پەنمیو؛ ئەستوور؛ باکردوو؛ هەڵمساو ☰ آماسیده

**پەنمیاگ** / penimyag/: ☜ پەنماو

**پەنمیان** / penimyan/: ☜ پەنمان

**پەنمین** / penimîn/: ☜ پەنمان

**پەنمیو** / penimîw/: ☜ پەنماو

**پەنەڕشکە** / peneřişke/: ☜ پرمێشک

**پەنەڕیشکە** / peneřîşke/: ☜ پرمێشک

**پەنەگا** / penega/: ☜ پەناگا

**پەنەم** / penem/: ناو. ماس؛ وەرەم ☰ آماس

**پەنەمان** / peneman/: ☜ پەنمان

**پەنەماندن** / penemandin/: چاوگ. هەڵتۆقاندن؛ ماسنای؛ ماسەنە ☰ متورم کردن

**پەنەماو** / penemaw/: ☜ پەنماو

**پەنەماوی** / penemawî/: ناو. گرووز؛ ماسورا هەڵتۆقاوی ☰ ورم

**پەنەمنای** / penemnay/: چاوگ. ١. کەڕوو پێ هێنان ٢. ئاوساندن؛ پەنەماندن ☰ ١. فاسد کردن ٢. متورّم کردن

**پەنەمووس** / penemûs/: ☜ پەندەمووس

⊡ **پەنەمووس کردن**: ١. پەنەمان؛ ماسین ٢. *[مەجاز]* جنێوێکە بە مانای با کردن و هەڵنەستانەوە و مردن ‹یا خوا پەنەمووس بکەی بۆ کارێ کردت!› ☰ ١. آماسیدن ٢. باد کردن و مُردن

**پەنەمیان** / penemyan/: ☜ پەنمان

**پەنەمیای** / penemyay/: چاوگ. ١. کەڕوو هاوردن ٢. ئاوسین؛ ماسین؛ با کردن ☰ ١. کپک زدن ٢. آماسیدن

**پەنەمیگ** / penemîg/: ☜ پەنماو

**پەنەمین** / penemîn/: ☜ پەنمان

**پەنەوا** / penewa/: ناو. خەنە؛ کەن ☰ خنده

**پەنها** / penha/: ناو. پەنا؛ پەسیو ☰ پناه

**پەنهان** / penhan/: ناوەڵناو. پێوار؛ وەشارتی ☰

پنهان

**پەنهانی** / penhanî/: ☜ **پەنامەکی**

**پـەنی**[1] / penî/: نـاو. پەڵـەی بچـووکی پێسـت؛ لەکەی پێست 🇮🇷 لکّەی پوست

**پەنی**[2]: ئاوەڵناو. دیار؛ ئاشکرا 🇮🇷 پیدا

**پەنیر** / penîr/: ناو. پەنێر؛ پێخوری برای ماسـت! 🇮🇷 پنیر

**پـەنیرۆک** / penîrok/: نـاو. پەنیرۆکـە؛ پـەنیرە؛ دەغلی دەنک شیلە تێگەڕاو، پێش فەریک بـوون 🇮🇷 دانەی غلەی نیمرسیدە

**پەنیرۆکە** / penîroke/: نـاو. ١. ☜ **پـەنیرۆک** ٢. ☜ **پەنیرە ـ٢**

**پـەنیرە** / penîre/: نـاو. ١. ☜ **پـەنیرۆک** ٢. پەنیرۆکە؛ تۆلک؛ نانەحاجیلە؛ پەپکەمەلیچک؛ گیا نانەشان؛ گیایەکی یەکساڵانەیـە، بنێکـی سـپی گۆشـتن و لقێکـی ڕاسـت و لـووس و گـەڵای پەنجەئاسا، بە گوڵی سپی ئاماڵ بنەوشی هەیە 🇮🇷 ١. ☜ **پەنیرۆک** ٢. پنیرک

**پەنێر** / penêr/: ☜ **پەنیر**

**پەنێرشک** / penêrşik/: ☜ **پرمێشك**

**پەنێرشکە** / penêrişke/: ☜ **پرمێشك**

**پەنێرکە** / penêrke/: ناو. بـۆقژە؛ نەخۆشـییەکی زاری منداڵی شـیرخۆرە 🇮🇷 نـوعی بیمـاری دهـان کودک

**پەوچێ** / pewçê/: ئامراز. پۆکێ؛ بۆیە؛ بـەو بۆنـەوە 🇮🇷 به این خاطر

**پەوکەی** / pewkey/: ئاوەڵـکار. پـەوکی؛ پـەوکێ؛ پەرەوکێ؛ بۆیە؛ لە بەر ئەمە ‹سەرم پەوکـەی نیـان نـەی ئاسـتۆنش/ نـە پایەنـداز بـە ئـەو ئاواتـەوازم «سەیدی»› 🇮🇷 به این دلیل؛ از این رو

**پەوکی** / pewkî/: ☜ **پەوکەی**

**پەوکێ** / pewkê/: ☜ **پەوکەی**

**پەوو** / pewû/: ☜ **پدوو**

**پەوینە** / pewîne/: نـاو. پەوینە؛ پاوانـە 🇮🇷 خلخـال مُچ پا

**پەوێنە** / pewêne/: ☜ **پەوینە**

**پەهـ** / peh/: دەنگ. وشـەی سـەیرمان و قەڵسـی ‹پەهـ لەو کارە خراپە!› 🇮🇷 وه؛ کلمەی تعجب

**پەهت** / peht/: ناو. ١. گڕی ئاگر؛ بڵێسە ٢. کـار و ڕەوتی پێژان بە ئاگر 🇮🇷 ١. زبانەی آتش ٢. پُختن

**پەهتن** / pehtin/: چاوگ. پێژان 🇮🇷 پُختن

**پەهتی** / pehtî/: ئاوەڵناو. برژاو 🇮🇷 پُختە یا برشتە

**پەهریز** / pehrîz/: ناو. پارێز 🇮🇷 پرهیز

**پەهلەڤان** / pehlevan/: ☜ **پاڵەوان**

**پەهن** / pehn/: ☜ **پان**

**پەهناندن** / pehnandin/: چاوگ. پـان کردنـەوە؛ پانەو کردن 🇮🇷 پهن کردن

**پەهنەک** / pehnek/: ناو. ١. تـەختایی چکۆلـە ٢. شانۆ؛ ناوگۆڕک 🇮🇷 ١. زمین کوچک هموار ٢. سکوی نمایش

**پەهنی** / pehnî/: ناو. پانیە؛ پاژنە پێ 🇮🇷 پاشنە

**پـەهنین** / pehnîn/: چاوگ. پـان بوونـەوە؛ پانـەو بوون 🇮🇷 پهن شدن

**پەهیز** / pehîz/: ☜ **پایز**

**پەی**[1] / pey/: نـاو. ١. دەمار؛ دامار؛ دەزوولەئاسـای لەشی گیانـەوەر کـە هەسـت و دنـەکان دەباتـە مێشـک و مـۆخ و وەڵامـەکان دەگەیێنێتـەوە ئەنـدامان ٢. شـوێن؛ شـۆپ؛ شـوێنەوار ٣. نـاخ؛ قووڵایی ‹تا نەچیتە بن بەحریکی بێ‌پەی/ جەواهیر و دوڕ چۆن پەیدا ئەکەی؟! «قانع»› ٤. بن؛ بنـە؛ بـێخ ‹پەی دانەوەی ماڵ› 🇮🇷 ١. پی؛ عصـب ٢. اثـر؛ رد ٣. عُمق ٤. بُن

⊡ **پەی بردن** تێگەیشتن؛ زانین 🇮🇷 پی بردن

**پەی دان** دەرکەوتنی بن و قووڵایی ئاو 🇮🇷 معلوم شدن عُمق آب

**پەی دانان** گرێـو دانـان؛ دە گرێـو نـان 🇮🇷 گـرو

گذاشتن

**پەی دانەوە:** کەندنی بنی شتێ 🇮🇷 پی کندن

**پەی کردن:** ١. پەڕاندن؛ بە قەڵت بڕین ٢. دوا کەوتن؛ ڕاوەدوو نان ٣. ڕیشە داکوتان ‹قامەتت نەخلە، بە شیری فائیقەی پەی کردووە/ نەحلی بێنێشی مەمەت، شەهدی سپی قەی کردووە «نالی»› 🇮🇷 ١. پی کردن ٢. تعقیب کردن ٣. ریشە دواندن

**پەی کەردەی:** دوا کەوتن 🇮🇷 تعقیب کردن

**پەی هاتن:** دوایی هاتن؛ تەواو بوون؛ بڕانەوە ‹بەسە ئەی خامە با ئەم باسە پەی بێ/ وەرە سەر باسەکی وا فائیدەی بێ «حاجی قادر»› 🇮🇷 تمام شدن؛ بە پایان رسیدن

**پەی**[2]: ئامراز. ١. لە بەر؛ بۆ ‹پەی یەکێ بمرە، پەی تۆ مردە بێ «مەسەل»› ٢. بۆ؛ بەرەو ‹پەی سنەی لوان› 🇮🇷 ١. برایِ؛ بە خاطرِ ٢. بە سوی

**پەیا**[1] / peya/: ناو. پیادە 🇮🇷 پیادە

**پەیا**[2]: ئاوەڵناو. پەیدا؛ دیار 🇮🇷 پیدا

▣ **پەیا کردن:** پەیدا کردن؛ وە دەس خستن؛ دیتنەوە 🇮🇷 یافتن

**پەیا بوون:** ١. دۆزرانەوە ٢. هاتنە دنیا 🇮🇷 ١. پیدا شدن ٢. متولد شدن

**پەیاپەی / peyapey/:** ئاوەڵکار. ١. بە دووی یەکا؛ بێپسانەوە ٢. گش؛ گشت 🇮🇷 ١. پیاپی ٢. عموماً

**پەیاخ / peyax/:** ناو. تەیاخ؛ پەیاغ؛ گالۆک؛ داردەستی ئەستوور 🇮🇷 چُماق

**پەیار / peyar/:** ئاوەڵناو. چەواشە؛ سەرلێشێواو 🇮🇷 سردرگم

**پەیارێ / peyarê/:** ☜ **پیادەڕۆ**

**پەیارێک / peyarêk/:** ☜ **پیادەڕۆ**

**پەیاغ / peyağ/:** ناو. تێلا؛ کوتەک؛ کۆپار 🇮🇷 چُماق

**پەیاک / peyak/:** ناو. پیادە؛ سەرباز؛ داشی شەترنج 🇮🇷 پیادەی شطرنج

**پەیاڵە / peyałe/:** ☜ **پیاڵە**

**پەیام / peyam/:** ناو. پەیغام؛ پەیخام؛ پێخام؛ پێخەم؛ پێغەم؛ نووچە؛ ڕاسپێری؛ ولام؛ هەواڵ؛ خەبەر ‹پەیامت هات و پەیکت ڕۆی، خەیاڵم نارد و نەیگەیێ/ ڕەسووڵم کەوتە ڕێ، گرتی، هێنای وەک ئاگرەسوورە «نالی»› 🇮🇷 پیام

**پەیامبەر / peyamber/:** ناو. پەیخامبەر: ١. پەیغامبەر؛ پەیغەمبەر؛ پەیغەمەر؛ پێخەمبەر؛ پێغەمبەر؛ پێغەمەر؛ ڕاسپاردەی خودا ٢. هەواڵبەر؛ کەسێ کە پەیامێک بگەیێنێتە کەسێ یان شوێنێک 🇮🇷 ١. پیامبر ٢. پیامرسان

**پەیامنێر / peyamnêr/:** ناو. هەواڵنێر؛ هەواڵدەر؛ ولامنێر: ١. کەسێ کە بۆ دەزگایەکی هەواڵدەر دەنگوباس کۆ دەکاتەوە ٢. کەسێ کە کاری نووسین و ڕاگەیاندنی هەواڵە 🇮🇷 ١و ٢. خبرنگار

**پەیامە / peyame/:** ئاوەڵکار. پاپیادە؛ پاپیارەتە؛ بە پێیان؛ بە پای پیادە 🇮🇷 پیادە

**پەیامهێن / peyamhên/:** ناو. خەبەرهێن؛ کەسێک ولامێک دەهێنێ 🇮🇷 پیامآور

**پەی . پەی / pey pey/:** ئاوەڵکار. پەیاپەی لە سەر یەک ‹ئەزانێ یار بێمەیلە، ڕەقیبی بەد گوهەر پەی-پەی/ خەیاڵی وایە ئەربابی مەی و مەیخوارە ڕیسوا کا «قانع»› 🇮🇷 پیاپی

**پەیت / peyt/:** ئاوەڵناو. توند و پتەو ‹بە ئیستیمداد و لوتفی بابەشێخ و هیممەتی کاکی/ گروگالێ دەکەم تا بڵێن لە چاو کوێر و شەلان پەیتە! «حەریق»› 🇮🇷 چابُک و مُحکم

**پەیتا / peyta/:** ئاوەڵکار. بێپسانەوە 🇮🇷 بدون انقطاع

**پەیتا . پەیتا / peyta peyta/:** ئاوەڵکار. لە سەر یەک؛ بێوچان و پسانەوە ‹پەیتا- پەیتا داوای قەرز دەکا› 🇮🇷 پیاپی

**پەیتوکە / peytûke/:** ناو. ١. جۆرێ چۆلەکەی

بچووکی فرۆک ٢. [کینایە] زۆر بزۆز و بێئارام ☰ ١. نوعی گنجشک کوچک تیزپرواز ٢. پرجُنب‌وجوش

**پەیتوون** / peytûn/: ناو. جۆرێک ماری زۆر گەورەی بێژاری هێلکەکەرە، لە ڕەگەزی ئەژدەرماران، بە چالاکی دەخزێ، مەلە دەکا و لە نیچیرەکەی دەهاڵێ و دەیهاڕێ ☰ مار پیتون

**پەیجۆ** / peyco/: ناو. ڤەگەڕ؛ شوێنگر ☰ جوینده

**پەیجۆر** / peycor/: ناو. ١. دواگەڕ؛ شوێنگیر ٢. تۆژەرەوە؛ کۆڵەرەوە ☰ ١. پیگیر ٢. پژوهشگر

**پەیجۆری** / peycorî/: ناو. ١. کاری شوێنگرتن؛ بە دووی شتێکدا چوون ٢. کاری تۆژینەوە؛ هلکەواشتن ☰ ١. پیگیری ٢. پژوهش

**پەیجە** / peyce/: ☜ **پەیژە**

**پەیچەڵ** / peyçeł/: ناوەڵناو. دۆخی حەیوانێ کە لە ڕۆیشتنا ئەژنۆ لێک دەدا ☰ حالت حیوانی که در راه رفتن زانوهایش به هم می‌خورد

**پەیخام** / peyxam/: ☜ **پەیام**

**پەیخامبەر** / peyxamber/: ☜ **پەیامبەر**

**پەیدا** / peyda/: ناوەڵناو. دیار؛ خویا؛ ئاشکرا ☰ پیدا

◻ **پەیدا بوون**: خویا بوون؛ ئاشکرا بوون؛ دیار دان؛ دەرکەوتن ‹تا فەلەک دەورەی نەدا سەد کەوکەبی ئاوا نەبوو/ کەوکەبەی میهری موبارەک تەلعەتی پەیدا نەبوو «نالی»› ☰ آشکار شدن

**پەیدا کردن**: گیر هێنان؛ وە دەست خستن؛ دۆزینەوە ☰ پیدا کردن

**پەیدابوو** / peydabû/: ناوەڵناو. ڕەخساو؛ ڕەخسیو ☰ مُمکن

**پەیدان** / peydan/: ناو. ئاوێ کە مرۆی تێدا ناخنکێ ☰ آبی که انسان در آن غرق نشود

**پەیدۆز** / peydoz/: ناو. تۆژەر؛ پەیجۆر؛ بنجۆر ☰ جستجوگر

**پەیدۆزی** / peydozî/: ناو. بنجۆری؛ پەیجۆری؛ کار و ڕەوتی گەڕان بۆ دۆزینەوە ☰ جستجو

**پەیدەرپەی** / peyderpey/: ناوەڵکار. پەیاپەی ☰ پیاپی

**پەیڕەو** / peyřew/: ناو. ١. بەرنامە؛ دەستووری کار ‹ئەم دینی ئێوە لە سەر کام دینە؟/ لە سەر کام پەیڕەو، لە کام ئایینە؟ «قانع»› ٢. مرید؛ دەست و پێوەند؛ دواکەوتووی کەسێک. هەروەها: **پەیڕەو بوون** ☰ ١. برنامەی کار ٢. پیرو

**پەیڕەوی** / peyřewî/: ناو. کاری بە گوێ کردن و دوا کەوتنی دەستووری یان کەسێک ‹خەڵکە! بەعزێ کەس لە ئینسانی چییان دیوە زەرەر/ وا هەمیشە مەشقی وەحشی و پەیڕەوی حەیوان ئەکەن؟! «ئەحمەد موختار جاف»› هەروەها: **پەیڕەوی کردن** ☰ پیروی

**پەیز** / peyz/: ☜ **پایز**

**پەیزەن** / peyzen/: ناوەڵناو. پەیژەن؛ دۆخی یەکسمێ کە لە ڕۆیشتنا پەل لە پەل دەدا. هەروەها: **پەیزەنی** ☰ ویژگی ستوری کە در رفتن سُم بە هم زند

**پەیژە** / peyje/: ناو. پەیجە؛ پەینجە؛ پاپاچینە؛ پاپەجینە؛ پاپەنجە؛ پایەنجە؛ پاپەینجە؛ پاپێنجە؛ پێ‌پەیژە؛ بەیجە؛ ترنجە؛ پاپیلکە؛ پاچینە؛ پەریز؛ پسترک؛ پیسترک؛ پیلپێلک؛ پێ‌بلقە؛ پلەکانە؛ پلەکان؛ سلەم؛ سولەم؛ نەردیوان؛ ناردیوان؛ نێردیوان؛ نەردەوان؛ ناردانی؛ نەردەوانێ؛ نەردانێ؛ نەردونگ؛ بەرکەک؛ ستر؛ سترە؛ بنستر؛ مەردیشان؛ قادرمە؛ سەردووک؛ کەرستەیەکی لە چێو یان کانزا بۆ پێدا هەڵگەڕان ☰ نردبام

◻ **پەیژەی جەحەنم**: [مەجاز] درێژ تا ئێوارە؛ درێژی ناڵەبار ☰ دراز بی‌قوارە

**پەیژەن** / peyjen/: ☜ **پەیزەن**

**پەیغام** / peyğam/: ☜ **پەیام**

**پەیغامبەر** / peyğamber/: ☜ **پەیامبەر ـ١**

**پەیغەمبەر / peyğember/:** ☜ پەیامبەر ـ١

**پەیغەمەر / peyğemer/:** ☜ پەیامبەر ـ١

**پەیف / peyf/:** ☜ پەیڤ

**پەیفگۆ / peyfgo/:** ☜ پەیڤاژۆ

**پەیڤ / peyv/:** ناو. پەیف؛ قسە؛ وتە؛ گوتە ‹قەڵەمەکەم چەکوچە و/ هەر پەیڤێکم بزمار/ ستەم لە هەر جێیەک بێ/ دەیسمم وەک تەختە دار «پەشێو»› ☰ گفتار؛ سخن

**پەیڤاژۆ / peyvajo/:** ناو. پەیفگۆ؛ وتاربێژ؛ وتاردەر ☰ سُخنران

**پەیڤاندن / peyvandin/:** چاوگ. وە دوان خستن ☰ به سخن آوردن

**پەیڤتن / peyvtin/:** چاوگ. ئاخۆتن؛ قسە کردن ☰ حرف زدن

**پەیڤین / peyvîn/:** چاوگ. ١. گوتن؛ وتن؛ ئاخافتن ٢. پێوان؛ ئەندازەگرتن ☰ ١. گفتن ٢. اندازه گرفتن

**پەیک / peyk/:** ناو. ١. ولامبەر؛ نامەبەر ‹ڕەقاسان وە ڕەقس وەرزش کەردەوە/ پەیک مەرگ حازر نە پشت پەردەوە «خانای قوبادی»› ٢. تەنی گەڕۆکی ئاسمانی ٣. نۆکەری تایبەتی ☰ ١. پیک ٢. سیّاره ٣. نوکر مخصوص

**پەیکار / peykar/:** ناو. ١. شەڕ و جەنگ؛ کێشە و هەرا ٢. پەیکان؛ سەرەتیر ☰ ١. پیکار ٢. پیکان

**پەیکان / peykan/:** ناو. پەیکار؛ سەرەتیر ‹ئەزم ئامانجی وان تیران ژ پەیکانان و سەرتیران/ بویم پوولاد ل بەر شیران سەراسەر تێک مام بەردە «مەلای جزیری»› ☰ پیکان

**پەیکوت / peykut/:** ناو. *[شووره‌یی]* حینچکە؛ کوت ☰ عمل کله زدن در جماع

**پەیکول / peykul/:** ☜ پێکول[1]

**پەیکوڵ / peykuł/:** ناو. پێکوڵ؛ دڕکێکی سێ سووچە ☰ خارخسک

**پەیکوڵە / peykułe/:** ☜ پێکوڵ[1]

**پەیکۆڵ / peykoł/:** ☜ پێکوڵ[1]

**پەیکۆڵێ / peykołê/:** ☜ پێکوڵ[1]

**پەیکەر / peyker/:** ناو. ١. کۆتەڵ؛ تیمسال؛ مەیماق؛ تووز؛ سوێس؛ هەتیل؛ موجەسەمە؛ هەیکەل؛ وێنەی داڕێژراوی هەر شتێک ٢. قالب؛ لەش؛ بەدەن ‹هەی کەرێکم بوو، چ پەیکەر؟ تەیکەری هەوراز و لێژ/ سینەپان و مووچەکورت و شانەبەرز و گوێدرێژ «نالی»› ☰ ١. تندیس ٢. تَن؛ بدن

**پەیکەرتاش / peykertaş/:** ناو. کۆتەڵتاش ☰ پیکرتراش

**پەیلەپەی / peylepey/:** ئاوەڵکار. پەیتا ـ پەیتا ‹ئەم شان و ئەو شان وەک کەوی پڕخاڵ/ هەڵئەسووڕێنێ پەیلەپەی دەسماڵ «قانع»› ☰ پیاپی

**پەیمان / peyman/:** ناو. ١. هەڤبەست؛ شۆن؛ ئەمەگ؛ قەول؛ بەڵێن؛ شەرت؛ تەی؛ سۆز؛ گفت؛ گفتە؛ بەخت؛ سامە؛ قەرار؛ جۆڤان؛ ئاد؛ ڕەوتی پێکهاتنی دوو یا چەند لایەن بۆ جێبەجێ کردنی کارێک ‹پەیمان، هەورە و بەجێ هێنانی بارانە «مەسەل»› ٢. بەڵێن؛ قەول ‹کچی جووتیار بۆ بەهەشتی ژین و دڵداری/ لەگەڵ کوڕی شوان بەستبووی پەیمانی یاری «گۆران»› ☰ ١. پیمان ٢. قَول و قرار

⊡ **پەیمان بەستن** قەول و قەرار پێکدان.

بەرانبەر: **پەیمان شکاندن** ☰ عهد بستن؛ پیمان بستن

**پەیمانڕاگر / peymanřagir/:** ئاوەڵناو. دەڤبگۆتن؛ بەڵێندار ☰ درست‌پیمان

**پەیمان‌شکێن / peymanş(i)kên/:** ئاوەڵناو. بێبەڵێن؛ بێبەخت؛ بێئامان؛ بەدقەول؛ بێقەول؛ بێشەرت‌وبەقا؛ خاوەن ئاکاری پێچەوانە لەمەڕ

پەیمانێ کە بەستوویە ☰ پیمان‌شکن

**پەیمانشکێنی** / peymanş(i)kênî/: ناو. بێبەڵێنی؛ بێشەرت و بەقایی ‹لە ناو کوردا نەبوو پەیمان شکاندن/ لە کوێ فێر بووی گوڵم، پەیمانشکێنی؟ «هێمن»› ☰ پیمان‌شکنی

**پەیمانکار** / peymankar/: ناو. بڕیەکار؛ کەسێ کە بە کونتەرات کار دەکا ☰ پیمانکار

**پەیمانکاری** / peymankarî/: ناو. قۆنتەرات؛ قونتەرات؛ مەختە؛ قەبەڵ؛ کونتەرات؛ کاری بە مزێکی یەکجاری ☰ کُنترات

**پەیمانگا** / peymanga/: ناو. پەیمانگە؛ دامەزراوەی فێرکاری؛ بنکەی زانستی ☰ انستیتو

**پەیمانگە** / peymange/: ☜ پەیمانگا

**پەیماننامە** / peymanname/: ناو. گرێبەست ☰ عهدنامه

**پەیمانە** / peymane/: ناو. پێوانە ☰ پیمانه

**پەین** / peyin/: ناو. ١. پەیین؛ پێن؛ شیاکە؛ سەنێر؛ سنێر؛ سەرین؛ سەورۆ؛ ڕیخ؛ ڕێخ؛ ڕەم؛ تەقزین؛ گوهوور؛ چوسلە؛ چۆسلی؛ توسلی؛ تەرس؛ کۆمای لاس و قەرسەقول و پشکەڵ ٢. *[مەجاز]* پەینێ کە بۆ کووتی زرعات بە کار دەڕوا ☰ ١. پِهِن ٢. کود حیوانی

**پەیناو** / peynaw/: ناو. پەیینی تێکەلاوی ئاو بۆ گەشەی شیناوەرد ☰ نوعی کود

**پەینجە** / peynce/: ☜ پەیژە

**پەینچی** / peynçî/: ناو. توونەوان؛ توونچی؛ ئاگرکەری گەرماو ☰ تونتاب

**پەینکە** / peyinke/: ناو. ئاردێ کە بە سەر ئەنگووتکە هەویریدا دەپڕژن ☰ آردی کە بر چونەهای خمیر پاشند

**پەینکێش** / peyinkêş/: ناو. کەسێ کە بارە پەین دەکێشێ ☰ پهن‌کش

**پەیەنەدەر** / peyneder/: ئاوەڵناو. بێبن؛ پێبڕ؛ بێپەی؛ زۆر قووڵ ☰ بسیار عمیق

**پەیور** / peywir/: ناو. ١. ئەرکی سەر شان ‹وان پەیورا خوە ب جهـ نەئانی› ٢. دەور؛ ڕۆڵ ‹پەیورا ڤێ پەیڤێ د هەڤۆکێ دەچییە؟› ☰ ١. وظیفه ٢. نقش

**پەیوەس** / peywes/: ☜ پەیوەست

**پەیوەست**[1] / peywest/: ناو. پەیوەس؛ پاشکۆ: ١. ئەوەی کە بەستراوە بە شتێکیترەوە ‹ئەم نامەیە پەیوەستی هەیە› ٢. یادداشتێک کە لە کۆتایی کتێب یان وتارێکەوە بۆ پاراو کردنی دێت ‹پەیوەستی کتێبەکە بریەتییە لە ناونامە و چەند وێنە› ☰ ١و٢. پیوست

⊡ **پەیوەست کردن** ١. پێکەوە لکاندن ٢. لەگەڵ خستن ☰ ١. به هم چسباندن ٢. پیوست کردن

**پەیوەست**[2]: ئاوەڵناو. نووساو؛ پەیوەس؛ پێکەوەلکاو ‹برۆی پەیوەست› ☰ پیوسته

**پەیوەستە**[1] / peyweste/: ئاوەڵناو. هەمیشەیی؛ بێپسانەوە ☰ پیوسته

**پەیوەستە**[2]: ئاوەڵکار. لەسەریەک؛ پەیتا ـ پەیتا ‹دلبەر ژ لەعلێن خۆی شەفاف، دا من مەیا گولگوون و ساف/ دەریایێ عیشقێ قاف و قاف، پەیوەستە تێتن جەزر و مەد «مەلای جزیری»› ☰ پیوسته

**پەیوەستەیی** / peywesteyî/: ناو. زنجیرە؛ گەواڵە؛ گەڵوازە ☰ تسلسُل

**پەیوەن** / peywen/: ☜ پەیوەند

**پەیوەند**[1] / peywend/: ناو. پێوەن؛ پێوەند: ١. متوربەی دار و گوڵ و گیا ٢. تێکەڵی و دۆستی ‹ئاخ لەگەڵ ئێمە حەبیبە سەر و پەیوەندی نییە/ نەیشەکەرقەددە، بەلا بەندی هەیە، قەندی نییە! «نالی»› ☰ ١. پیوند گُل و گیاه ٢. رابطه

⊞ **پەیوەندی نێودەوڵەتی** دانوستانی ولاتانی لێکجودا ☰ روابط بین‌الملل

⊡ **پەیوەند دان** هەنج کرن؛ گەیاندنە یەک؛ لێک گیر دان ☰ مُتصل کردن

**پەیوەند کردن:** متوربە کردنی دار و گوڵ و گیا ⧉ پیوند زدن گُل و گیاه

**پەیوەند**[2]: ئاوەڵناو. پێوەند؛ لکاو؛ چەسپاو ‹دوو برۆی پەیوەند› ⧉ مُتصل

**پەیوەندی**[1] / peywendî/: ناو. پێوەندی: ١. پەیوەند؛ تێکەڵی و دۆستی ٢. ڕەوتی ئاڵوگۆڕ کردنی زانست ‹بۆ زانیاری زۆرتر پەیوەندیمان پێوە بکەن› ٣. کار و ڕەوتی چوونەوە سەر ‹ئەم کارە، هیچ پەیوەندییەکی بە منەوە نییە› ٤. زانیاری ئاڵوگۆڕکراو ‹پەیوەندی پردێکە بۆ لە یەک تێگەیشتن› ٥. شێوازی ئاڵوگۆڕ کردنی زانیاری ‹پەیوەندی ئینتەرنێتی› ٦. بەستەیی؛ بەستەگی ‹ئەم کارە، پەیوەندی بە تۆوە هەیە، بکرێ یان نە› ⧉ ١. رابطه ٢. تماس ٣. ربط ۴. ارتباط ۵. ارتباطات ۶ بستگی

⊡ **پەیوەندی پێوە کردن:** ☜ **پەیوەندی کردن**

**پەیوەندی دان:** کردنەوەی ڕێگایەک بۆ ئاڵوگۆڕ لە نێوان دوو شتی لێک جودا ⧉ ارتباط دادن

**پەیوەندی کردن:** پەیوەندی پێوە کردن؛ دامەزراندنی پەیوەندی ⧉ ارتباط برقرار کردن

**پەیوەندی**[2]: ئاوەڵناو. پێوەندی؛ بە تایبەتمەندی پێکەوە پێوەند کردن ‹ڕێگای پەیوەندی› ⧉ ارتباطی

**پەیوەندیدار** / peywendîdar/: ئاوەڵناو. پێوەندیدار؛ بەسراو؛ خاوەن پەیوەندی ⧉ مُرتبط

**پەیوین** / peywîn/: چاوگ. پەیڤین؛ قسە کردن؛ دوان ‹هەزاران داوود و دەنگی زەمووری/ دە بەر لێوت مرن کاتێ دەپەیوی «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ⧉ سخن گفتن

**پەیین** / peyîn/: ☜ **پەین**

**پهێت** / pihêt/: ئاوەڵناو. بەهێز؛ زۆردار ‹ئەفە زەلامەکی پهێتە› ⧉ قوی

**پی**[1] / pî/: ناو. ١. پیو؛ چەورایی ٢. ☜ **پدو** ⧉ ١. پیە ٢. ☜ **پدو**

**پی**[2]: ئاوەڵناو. پووچەڵ؛ پووک؛ ناوبەتاڵ ⧉ تُهی

**پی**[3]: ئامراز. بەم؛ بە ئەم ‹پی تەورە شەیتان دام نەرێ تەندەن/ قووەی پای تاقەت تاعەت نەمەندەن «مەلا خزری ڕواری»› ⧉ به این؛ بدین

**پیا**[1] / p(i)ya/: ناو. ١. پیاو؛ پیاگ ٢. *[مەجاز]* نۆکەر؛ خزمەتکار ⧉ ١. مرد ٢. نوکر

**پیا**[2]: ئامراز. بە ئەوا؛ بە ویدا ‹هێنای پیا؛ کێشای پیا› ⧉ بر آن

**پیا-**[3]: پێشگر. پێدا؛ بە شتێکدا ‹پیاساوین› ⧉ به چیزی؛ بر چیزی

**پیابردن** / p(i)yabirdin/: ☜ **پێدابردن**

**پیاپەریگ** / p(i)yaperîg/: ئاوەڵناو. شێتۆکە؛ لێوە ⧉ خُل مَزاج

**پیاچزان** / p(i)yaçizan/: ☜ **پێداچزان**

**پیاچزاندن** / p(i)yaçizandin/: ☜ **پێداچزاندن**

**پیاچزانن** / p(i)yaçizanin/: ☜ **پێداچزاندن**

**پیاچون** / p(i)yaçûn/: ☜ **پێداچون**

**پیاچونەوە** / p(i)yaçûnewe/: ☜ **پێداچونەوە**

**پیاچەقاندن** / p(i)yaçeqandin/: ☜ **پێداچەقاندن**

**پیاداری** / p(i)yadarî/: ☜ **پیاوەتی**

**پیادان** / p(i)yadan/: ☜ **پێدادان**

**پیادورین** / p(i)yadûrîn/: ☜ **پێدادرون**

**پیادە**[1] / p(i)yade/: ناو. ١. پێرەو؛ پێرۆ؛ سەڵتە؛ سەوادە؛ سوادە؛ پەیا؛ پاپیا؛ پیاوە؛ نانا؛ وەرێ؛ ئەو کەسەی بە پێیان بڕوا ‹سوار لە حاڵ پیادە نازانێ «مەسەل»› ٢. سەرباز؛ پەیاک؛ داشی شەترەنج ⧉ ١. پیاده ٢. سرباز شطرنج

**پیادە**[2]: ئاوەڵناو. بە پێ؛ بێ ئامرازی گوزانەوە ‹کێ سوارە و کێ پیادە؟› ⧉ پیاده

**پیادە**[3]: ئاوەڵکار. بە پێ؛ بە پای پیادە ‹پیادە هات› ⧉ پیاده

**پیـادەڕۆ** / p(i)yadeřo/: نـاو. نانـا؛ پێـڕەو؛ سـەوادەڕێ؛ پیـادەڕەو؛ پێیانـەڕێ؛ پـەیاڕێ؛ پەیارێک؛ پێڕەوگە؛ شۆستە؛ شـوێنی تایبـەت بـۆ ڕۆیشتنی پیادە لە شەقامدا ☰ پیادەرو

**پیادەڕۆیی** / p(i)yadeřoyî/: ناو. بمـەش؛ کـاری ڕۆشتن بە پێ ☰ پیادەروی

**پیادەڕەو** / p(i)yadeřew/: ☜ **پیادەڕۆ**

**پیـادەڕێ** / p(i)yadeřê/: نـاو. پیـاوەڕۆ؛ پـێ‌ڕێ؛ ڕێگەیێ کە تەنیا پیادە دەبوێرێ و سوار تێـدا بـڕ ناکا ☰ راه پیادەرو

**پیار** / p(i)yar/: ناو. بێ‌نوێژی؛ مەهیک ☰ قاعدگی

**پیـارزک** / p(i)yarzig/: نـاو. پیـارزە؛ پرێسـکە؛ پریاسکە؛ پیاسکە؛ پیارسکە؛ بوخچەی بچووک بۆ کەل‌وپەل ☰ بُقچەی کوچک

**پیارزگ** / p(i)yarzig/: ☜ **پیاسکە**

**پیارزە** / p(i)yarze/: ☜ **پیارزك**

**پیارسکە** / p(i)yarske/: ☜ **پیارزك**

**پیاڕاگەیانـدن** / p(i)yařageyandin/: ☜ **پێداڕاگەیاندن**

**پیـاز** / p(i)yaz/: نـاو. پیـواز؛ پیڤـاز: ١. خسـکە؛ خلیسـکە؛ سـاقەتەی خـڕ و کـورتی ژێـرزەوینی بـڕێک ڕوەک ٢. سـەرک؛ سـەلک؛ بـن؛ بـنچ؛ بنۆکەی هەڵمساوی پیواز کـە پێگەیشـتووەکەی بۆیـەکی تونـدی هەیـە و تـۆژاڵ ـ تۆژاڵـە ٣. بیچمێک وەک پیاز لە گیا و گیانـەوەردا ‹پیـازی مو› ☰ ١تا٣. پیاز

⊡ **پیاز پاک کردن**: ڕیایی و تاریفی بـە درۆ کـردن ☰ تملق و ریا کردن

**پیازاو** / p(i)yazaw/: ناو. پیوازاو؛ شـیوی پیـواز و ئاو و ڕۆن ☰ آش پیاز

**پیازپاککـەر** / p(i)yazpakker/: ئاوەڵـناو. *[کینایـە، پلار]* ماستاوکەر؛ کلکەسووتەکەر ☰ چاپلوس

**پیازخوگانـە** / p(i)yzxûgane/: ناو. هاز ☰ گیـاهی شبیه پیاز

**پیازداخ** / p(i)yazdax/: ☜ **پیازداغ**

**پیازداغ** / p(i)yazdağ/: ناو. پیازداخ؛ بوریژ؛ ورتکە پیوازی لە ڕۆندا سوورەوکراو ☰ پیازداغ

**پیازۆکـە** / p(i)yazoke/: نـاو. پیازەکێویلـەـە؛ گیایەکی کێوییە وەک پیواز دەچێ ☰ پیاز کوهی

**پیازە** / p(i)yaze/: ناو. تاوان؛ گوناح ☰ گُناه

**پیازەخوانکـە** / p(i)yazexiwanke/: نـاو. سیرەسەگانە؛ پیازێکە گەڵاکانی لە پیواز دەچێ و لە کێو و شاخ شین دەبێ ☰ نوعی سیر کوهی

**پیازەخوگانـە** / p(i)yazexûgane/: ☜ **پیازەمشکانە**

**پیازەکەوڵی** / p(i)yazekewłî/: ☜ **پیازەمشکانە**

**پیازەکێویلە** / p(i)yazekêwîle/: ☜ **پیازۆکە**

**پیازەگولـە** / p(i)yazegule/: نـاو. پیـازی ورچ؛ پیازی هورچ؛ گیایەکـە بـۆ نەخۆشـی ڕیخۆڵـەی دوانزەگرێ بە کەڵکە ☰ سورنجان؛ گل حضرتی

**پیازەمارانە** / p(i)yazemarane/: ناو. سـیرمۆکە؛ گیایەکە ☰ گیاهی است

**پیازەمشکانە** / p(i)yazemişkane/: ناو. پیازۆکـە؛ پیازەکەولـی؛ پیازەخووگانـە ☰ پیـاز مـوش؛ پیاز کوهی

**پیـازی**[1] / p(i)yazî/: ناو. ڕەنگـی توێکڵـی پیـاز ☰ پیازی

**پیـازی**[2]: ئاوەڵناو. ١. بە ڕەنگی توێکڵی پیاز ٢. سەر بە پیاز ٣. تۆ ـ تۆ، وەک پیاز ☰ ١. پیـازی رنـگ ٢. مربوط به پیاز ٣. پوست بر پوست

**پیاسـاو** / p(i)yasaw/: نـاو. ڕێخـەر؛ پیمـاڵ ☰ ساینده

**پیاساوین** / p(i)yasawîn/: ☜ **پێداساوین**

**پیاسکە** / p(i)yaske/: نـاو. پیـارزگ؛ پرێسـکە ☰ بُقچەی کوچک

**پیاسە** / p(i)yase/: نـاو. ڕاوێچکـە؛ کـاری گاڤـان؛

گەشت و گەڕانی بە پێ بۆ خۆشی و ڕابواردن ■ قدم‌زنی

**پیاکردن** / p(i)yakirdin/: ☜ **پێداکردن**

**پیاکێشان** / p(i)yakêşan/: ☜ **پێداکێشان**

**پیاگ** / p(i)yag/: ☜ **پیاو**

**پیاگانە** / p(i)yagane/: ☜ **پیاوانە**

**پیاگرتن** / p(i)yagirtin/: ☜ **پێداگرتن**

**پیاگەتی** / p(i)yagetî/: ☜ **پیاوەتی**

**پیاگەری** / p(i)yagerî/: ☜ **پیاوەتی**

**پیاگەیاندن** / p(i)yageyandin/: ☜ **پێداگەیاندن**

**پیاگیران** / p(i)yagîran/: ☜ **پێداگیران**

**پیاڵە** / p(i)yałe/: ناو. پەیاڵە؛ جام: ١. کوتک؛ جامۆڵە؛ دەفری بچووکی قووڵ ٢. *[ئەدەبی]* دەفری شەراو ‹ژاڵەمەی لالە پیاڵەی هێنا/ بای شەماڵ بۆنی هەلالەی هێنا «حەقیقی»› ■ ١. پیالە ٢. ظرف شراب

**پیاڵەفرۆش** / p(i)yałef(i)roş/: ناو. مەی‌فرۆش؛ کەسێ کە ئارەق و شەراب بە وردە دەفرۆشێ ■ می‌فروش

**پیامال** / p(i)yamał/: ناو. ڕێخەر؛ پیاساو ■ ساینده

**پیامالین** / p(i)yamałîn/: ☜ **پێدامالین**

**پیان** / p(i)yan/: ناو. جامیلکە؛ پیاڵەی لە مس؛ قاپۆکەی مسی ■ پیالەی مسین

**پیانان** / p(i)yanan/: ☜ **پێدانان**

**پیانوسان** / p(i)yanûsan/: ☜ **پێدانوسان**

**پیانوساندن** / p(i)yanûsandin/: ☜ **پێدانوساندن**

**پیاو** / p(i)yaw/: ناو. پیاگ؛ پیا؛ مێر؛ پا: ١. مۆردەم؛ نێری بنیادەم؛ مرۆڤی نێرینەی پێگەیشتوو ‹پیاوی بێ‌ژن وەکوو ئەسپی بێ‌هەوسارە «مەسەل»› ٢. شوو؛ مێرد؛ مێرو؛ مێردە؛ هاوسەری ژن ‹پیاو، چەقۆیە و ژن هەسان «مەسەل»› ٣. نێر؛ مرۆڤی نێرینە ‹تیپی کچان لەو دەشتە/ وێنەی حۆری بەهەشتە/ پیاو ئەبەن لە خشتە «پیرەمێرد»› ٤. *[مەجاز]* مەرد؛ مەردەمێر؛ جوامێر؛ کوڕ؛ ئەوەی خوو و خدەی بەرزە ‹پیاوێک هەڵدەستا و حەقی دەنایە مستی› ٥. مەرد؛ کوڕ؛ کەسێ کە توانست و لێهاتوویی جێبەجێ کردنی کارێکی هەبێ ‹پیاوی کار› ٦. مرۆ؛ ئینسان ‹پیاو سەری سوور دەمێنێ› ٧. *[سەرزارەکی]* لێهاتوو لە باری جنسیوە ‹چەن ساڵە پیاو نییە!› ٨. *[مەجاز]* نۆکەر و خولام ‹من پیاوێکم پیاوی تۆ› ■ ١تا ٧. مرد ٨. نوکر

▣ **بە پیاو نەزانین**: پێ قایل نەبوون ■ داخل آدم حساب نکردن

**پیاوانە**[1] / p(i)yawane/: ئاوەڵناو. پیایانە؛ پیاگانە؛ مێرانە؛ مەردانە؛ مێردانە: ١. پێوەندیدار یان سەر بە پیاوان ‹پێلاوی پیاوانە› ٢. کوڕانە؛ مێرەکی؛ ئازایانە؛ مەردانە؛ چالاکانە؛ وەکوو پیاوان ‹هەڵمەتی پیاوانە› ■ ١و٢. مردانە

**پیاوانە**[2]: ئاوەڵکار. پیاوانە؛ پیاگانە؛ مێرانە؛ کوڕانە؛ پیایانە؛ بە ڕەوشتی پیاوان ‹پیاوانە هاتە مەیدان› ■ مردانە

**پیاوبەپیاو** / p(i)yawbep(i)yaw/: ناو. کار و ڕەوتی بە هەرەوز کار کردنی نۆرەیی ■ تعاونی

**پیاوبەزێن** / p(i)yawbezên/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* بلەربەزێن؛ زۆر بەهێز و گورد ■ مردافکن

**پیاوتۆقێن** / p(i)yawtoqên/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* هۆڤ؛ ترسێنەر ■ مخوف؛ ترسناک

**پیاوچاک** / p(i)yawçak/: ناو. خواپەرستی ڕاست ■ ابدال

**پیاوچاکان** / p(i)yawçakan/: ☜ **پاکان**

**پیاوخاس** / p(i)yawxas/: ئاوەڵناو. قەنج؛ جوامێر؛ مەرد ■ جوانمرد

**پیاوخراپ** / p(i)yawx(i)rap/: ئاوەڵناو. پیاوخراو:

١. بێ‌فەڕ؛ نامەرد ٢. گونابار؛ خەتابار 🇮🇷 ١. نامرد ٢. گُناهکار

**پیاوخراو** / p(i)yawx(i)raw/: ☜ **پیاوخراپ**

**پیاوخۆر** / p(i)yawxor/: ناوەڵناو. [مەجاز] خەڵک‌ترسێن 🇮🇷 ترسناک

**پیاوفرۆش** / p(i)yawf(i)roş/: ناوەڵناو. [مەجاز] دەسبڕ؛ خاپینۆک؛ ناڕاست 🇮🇷 فریبکار؛ نادُرُست

**پیاوکوژ** / p(i)yawkuj/: ناوەڵناو. مرۆکوژ؛ پیاوگوژ؛ میرکوژ 🇮🇷 آدمکش

**پیاوگوژ** / p(i)yawguj/: ☜ **پیاوکوژ**

**پیاوماقوڵ** / p(i)yawmaqûł/: ناو. ١. پیاوی ئاوڕوودار و خاوەن قەدر و ڕێز ٢. ڕیش‌سپی و دەمڕاست 🇮🇷 ١. ابدال ٢. ریش‌سفید

**پیاوە** / p(i)yawe/: ناو. پێرەو؛ پێڕۆ؛ پاپیا؛ وەڕێ 🇮🇷 پیادە

⊡ **پیاوە بون**: دابەزین؛ داخۆزین 🇮🇷 پیادە شدن

**پیاوەتی** / p(i)yawetî/: ناو. پیاگەتی؛ پیاگەری؛ پیاداری؛ مرۆڤایەتی؛ جامێری؛ جوامێری؛ مەردی؛ مەردایەتی: ١. غیرەت؛ دۆخ یان چۆنیەتی دارا بوونی تایبەتمەندیگەلی پیاوانە ‹پیاوەتی بە نیشە، نەک بە ڕیش «مەسەل»› ٢. مێرخاسی؛ دۆخ یان چۆنیەتی دارا بوونی تایبەتمەندیگەلی چاک ‹پیاوەتی نییە درۆی لەگەڵ بکەی› 🇮🇷 ١و٢. مردانگی

**پیاوەدارینە** / p(i)yawedarîne/: ناو. بووک؛ بووکەڵە؛ بووکەبارانە 🇮🇷 مترسک

**پیاوەڕۆ** / p(i)yawero/: ☜ **پیادەڕێ**

**پیاوێژگە** / p(i)yawîjge/: ناو. [پلار] ١. پیاوی چکۆلانە ٢. زەلامۆک؛ بۆرەپیاگ؛ پیاوی خوێڕی 🇮🇷 ١. مرد کوچک ٢. بیکارە

**پیاهاتن** / p(i)yahatin/: ☜ **پێداهاتن**

**پیاهاتنەوە** / p(i)yahat(i)newe/: ☜ **پێداهاتنەوە**

**پیاهانین** / p(i)yahanîn/: ☜ **پێداهێنان**

**پیاهاوردن** / p(i)yahawirdin/: ☜ **پێداهێنان**

**پیاهەڵپژان** / p(i)yahełp(i)jan/: ☜ **پێداهەڵپژان**

**پیاهەڵپژاندن** / p(i)yahełpijandin/: ☜ **پێداهەڵپژاندن**

**پیاهەڵپەساردن** / p(i)yahełpesardin/: ☜ **پێداهەڵپەساردن**

**پیاهەڵچوون** / p(i)yahełçûn/: ☜ **پێداهەڵچوون**

**پیاهەڵچەقان** / p(i)yahełçeqan/: ☜ **پێداهەڵچەقان**

**پیاهەڵچەقین** / p(i)yahełçeqîn/: ☜ **پێداهەڵچەقان**

**پیاهەڵخوشین** / p(i)yahełxuşîn/: ☜ **پێداهەڵخوشان**

**پیاهەڵخوێندن** / p(i)yahełx(i)wêndin/: ☜ **پێداهەڵخوێندن**

**پیاهەڵدان** / p(i)yahełdan/: ☜ **پێداهەڵدان**

**پیاهەڵشاخان** / p(i)yahełşaxan/: ☜ **پێداهەڵشاخان**

**پیاهەڵشاخین** / p(i)yahełşaxîn/: ☜ **پێداهەڵشاخان**

**پیاهەڵکاڵان** / p(i)yahełkałan/: ☜ **پێداهەڵکاڵان**

**پیاهەڵکاڵین** / p(i)yahełkałîn/: ☜ **پێداهەڵکاڵان**

**پیاهەڵگوتن** / p(i)yahełgutin/: ☜ **پێداهەڵگوتن**

**پیاهەڵگەڕان** / p(i)yahełgeřan/: ☜ **پێداهەڵگەڕان**

**پیاهەڵمێزان** / p(i)yahełmêzan/: ☜ **پێداهەڵمێزتن**

**پیاهەڵمێزتن** / p(i)yahełmêztin/: ☜ **پێداهەڵمێزتن**

**پیاهەڵمێزین** / p(i)yahełmêzîn/: ☜ **پێداهەڵمێزتن**

**پیاهەڵنان** / p(i)yahełnan/: ☜ **پێداهەڵنان**

**پیاهەڵواسین** / p(i)yahełwasîn/: ☜ **پێداهەڵواسین**

**پیاهێنان** / p(i)yahênan/: ☜ **پێداهێنان**

**پیایانە** / p(i)yayane/: ☜ **پیاوانە**

**پیپ** / pîp/: ناو. ١. بۆشکە؛ بەرمیل؛ دەفری زۆر زلی تراو تێ‌کردن ٢. قەندە؛ مۆمەقەند؛ قەنگە ⇐ ١. بُشکە ٢. پیپ

**پیپڕ** / pîpiř/: ناوەڵناو. [پەلار] قەڵەو؛ گۆشتن؛ پڕگۆشت ⇐ چاق

**پیپڕک** / pîpiřk/: ناوەڵناو. [پەلار] کوڵەبندەسی؛ قەڵەوی کورتەبنە ⇐ چاقالو

**پیپک** / pîpik/: ناو. تەگەر؛ پێچک؛ چەرخی گاری و عەرابە ⇐ چرخ ارّاده

**پیپنۆک** / pîpnok/: ناو. چارەچەقیلە؛ جۆرێ خەشخاشی ناسک ⇐ نوعی خشخاش

**پیپۆک** / pîpok/: ناو. کریستاڵ؛ شیشەی تراش ⇐ کریستال

**پیپیک** / pîpîk/: ناو. فیکە؛ فیت؛ فیتە؛ فیقە ⇐ سوت

**پیت**[1] / pît/: ناو. ١. حەرف؛ دانە دانەی ئەلفوبێتکە ‹دەڵێن زانا و ئەدیب و خوێندەوارە/ ئەگەر نەیخوێندبێ شەش پیت و دوو دێڕ «هێمن»› ٢. بەرەکەت و فەڕ ‹بەفر پیتە، بەهرەیە بۆ کانیاوی مووچە و مەزرای جووتیاران، دابینکەری نیازی کشت وکاڵە و لە ڕاستییا بەفر هۆی شینایی و شیناوەردە «سوارە»› ٣. کاپۆڵ؛ کاجیر؛ کەللەسەر ٤. کوفارە؛ فوارە؛ فیچقە ٥. تووتە؛ قامکە چکۆلە ⇐ ١. حرف ٢. برکت ٣. جُمجُمه ۴. فواره ۵. انگشت کوچک

▣ **پیتی دەنگدار**: یەکێتە؛ هەر یەکە لە پیتەکانی ئەلفوبێتکە کە لە کاتی وتنەوەیاندا دەنگ بە لەرینەوەی تارەکانی گەروو دێتە دەرێ و زار دەکرێتەوە تا هەوا بێ‌گرفت لە لێوەوە بچێتە دەرەوە (وەکوو: ـە، ـا، ـێ، ـی، ـۆ، ـوو) ⇐ حرف صدادار

**پیتی کپ**: پیتی بێ‌دەنگ؛ هەرکام لە پیتەکانی ئەلفوبێتکە کە بۆ گوتنیان پێویستە بیاندەینە پاڵ یەکێک لە دەنگەکانەوە (وەک: ب، پ، چ، ک، ...) ⇐ حرف بی‌صدا

▣ **پیت دانەوە**: خێر دانەوە؛ بەهرە دانەوە ‹شوکور مانگاکەم باش پیتی داوە› ⇐ پُربَرکت شدن

**پیت**[2]: ناوەڵناو. کرمۆڵ؛ کرمخواردوو ⇐ کرمو

**پیت**[3]: ناوەڵکار. ١. هێدی؛ ئەسپایی ٢. هندک؛ کەمووسکە ⇐ ١. یواشکی ٢. اندک

**پیتار** / pîtar/: ناو. داری کۆن و ڕزیو ⇐ درخت پیر و فرسوده

**پیتاک** / pîtak/: ناو. ١. باج و خەراجی دەوڵەت ‹کێ بێ کە ببێ لە ئێوە بێباک؟/ کێ بێ کە نەدات بە ئێوە پیتاک؟ «هەژار، *مەم و زین*»› ٢. باروبوو؛ کاری پارەی کۆمەگی کۆ کردنەوە ⇐ ١. باج دولتی ٢. جمع‌آوری اعانه

**پیتاکوەرگر** / pîtakwergir/: ناو. ڕادار؛ باجگر ⇐ باجگیر

**پیتاکی** / pîtakî/: ناو. ساوەری؛ جزیە؛ باجی تایبەت کە ناموسوڵمانان دەبوو بە فەرمانڕەوای موسوڵمانانیان بدایە ⇐ جزیه

**پیتان** / pîtan/: ناو. جۆرێ گاڵتە بە چەو ⇐ نوعی بازی با شن

**پیتاندن** / pîtandin/: چاوگ. بە پیت کردن؛ دەوڵەمەند کردن ⇐ غنی ساختن

**پیتچن** / pîtçin/: ناو. پیتکار؛ حەرفچن: ١. ئەوەی لە چاپخانەدا پیتان ڕێک دەکا ٢. تایپیست ⇐ ١. حروفچین ٢. تایپیست

**پیتچنی** / pîtç(i)nî/: ناو. تایپ؛ کاری نووسین بە

مەکینە و کەمپیوتەر 🇮🇷 تایپ

**پیتزا** / pîtza/: ناو. پێخۆرێکی ڕۆژاواییانە لە گۆشت، بیبار، قارچک و پەنیر و ... لە سەر هەویری دەبرژێنن 🇮🇷 پیتزا

**پیتک** / pîtik/: ناو. ١. پیک؛ کوتک؛ کوتەی ئاسنی ٢. پتە؛ کاری بە سەری قامک لێ دان ٣. عەیب؛ شوورەیی ٤. چەو لە هێندێک گاڵتەدا ٥. شۆڕەبی؛ شەنگەبی 🇮🇷 ١. پُتک ٢. تلنگُر ٣. عیب؛ عار ۴. شنِ بازی ۵. بید مجنون

⊡ **پیتک خستن**: پەلەپیتکە لێ دان؛ زیپکەبەرد بە سەری قامک هاویشتن 🇮🇷 با تلنگُر خرده سنگ انداختن

**پیتکار** / pîtkar/: ناو. پیتچن 🇮🇷 حروفچین

**پیتکە** / pîtke/: ناو. ١. ڕەوتی قەڵەشانی توێکڵە گوێز، کاتێک وشک دەبێتەوە ٢. ناتۆرە؛ ناونیتکە 🇮🇷 ١. فرآیند ترک خوردن پوسته گردوی رسیده ٢. انگ

⊡ **پیتکە پیا خستن**: ناتۆرە لێدان؛ ناونیتکە لێ نیان 🇮🇷 انگ زدن

**پیتگە** / pîtge/: ناو. نەعنا؛ جاترە 🇮🇷 نعناع

**پیتوبەرەکەت** / pît û bereket/: ناو. خێر و بەرەکەت ‹پارەی ئەم دەورە پیت و بەرەکەتی نەماوە› 🇮🇷 خیر و برکت

**پیتۆڵ** / pîtoł/: ئاوەڵناو. وریا؛ زرەنگ ‹ئەی گوێگری ژیر و زیت و پیتۆڵ/ پسپۆڕی وتەی بەنرخ و کرمۆڵ «هەژار، *مەموزین*»› 🇮🇷 زیرک؛ هوشیار

**پیتو** / pîtû/: ☜ **باشو**

**پیتە** / pîte/: ناو. بەڵم؛ کای هەرزن و چەڵتووک 🇮🇷 کاهِ ارزن و شالی

**پیتەبرە** / pîteb(i)ře/: ناو. کرمی ناسکی دەغڵ 🇮🇷 کرم ساقەخوار

**پیتەپیت** / pîtepît/: ئاوەڵکار. هێدی ـ هێدی؛ سەبرە ـ سەبرە؛ لەسەرخۆ 🇮🇷 یواش ـ یواش

**پیتە ـ پیتە** / pîte pîte/: ئاوەڵکار. کەمە ـ کەمە؛ تۆزە ـ تۆزە 🇮🇷 اندک ـ اندک

**پیتەڵووک** / pîtełûk/: ☜ **پیرەڵۆك**

**پیتەڵووکە** / pîtełûke/: ناو. باپووک؛ باپووسکە ‹پیتەڵووکەی زستانێ بە باوە هەڵوەدایە/ سەهۆڵی دەشت و دۆڵان، کوڵۆڵی دەستی بایە «ڕاوچی»› 🇮🇷 برف ریز و سبک

**پیتەوا** / pîtewa/: ناو. کاڵا؛ ماڵ؛ ئەوەی بۆ کڕین و فرۆشتن بشێ 🇮🇷 کالا

**پیتێ** / pîtê/: ناو. وشەیەکی ژنانەیە بۆ بانگ کردنی یەکتر 🇮🇷 خواهر؛ کلمەی خطاب زنان بە یکدیگر

**پیچ** / pîç/: ئاوەڵناو. ١. پووچەڵ؛ پووچ؛ واڵا؛ ناوبەتاڵ ٢. زۆڵ؛ بێژ؛ بیژ ٣. کەم؛ هندک 🇮🇷 ١. توخالی ٢. حرامزاده ٣. اندک

**پیچازی** / pîçazî/: ئاوەڵناو. چوارخانەی ڕەنگامە 🇮🇷 پیچازی

**پیچک** / pîçik/: ناو. ١. کفتەی ساواری بێ ناوئاخن ٢. گیایەکی کوێستانییە بۆ دەرمان دەبێ 🇮🇷 ١. کوفتەی سادەی بلغور ٢. گیاهی است

**پیچەک** / pîçek/: ئاوەڵکار. کەمێک؛ تۆزێک 🇮🇷 اندکی

**پیچی** / pîçî/: ناو. سەری قامک؛ بەندی لای سەرووی تبل 🇮🇷 بند انتهای انگشت

**پیر**[١] / pîr/: ناو. ١. مێر؛ ڕیشسپی؛ ڕیشچەرمووە/ چەرمگ (پیاو)؛ پۆپەچەرمگ/ چەرموو (ژن)؛ ئەوەی تەمەنێکی زۆری هەیە ‹دیم پیرێ لە مەیخانە سەری دەخولاوە/ ناترسی وتم کە بمری؟ چت بۆ ماوە؟! «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ٢. شێخی تەریقەت ‹هەر کەسێ مایل بە پیرێکە و تەریقێکی هەیە/ تۆ بە شوعلەی غەم حەریقی وا وەجاخت هەڵگراند «حەریق»› ٣. مەرقەدی پیاوچاکان ‹چەند چاک و پیرت بۆ دەخولامەوە/ لە

بەر سێبەرت نەحەسامەوە «فولکلۆر»› ≡ ۱. پیر ۲. مُرشد ۳. مَزار

▣ **پیری سەد ساڵە:** مرۆی زۆر بە ساڵان چووی خاوەن ئەزموون ≡ پیر کهنسان و کارآزموده

**پیر**[۲]: ئاوەڵناو. بەتەمەن؛ کاڵ؛ ساڵمەند؛ زورهان؛ بەساڵاچوو ‹دایەگەورەم گەلێک پیرە› ≡ پیر

◘ **پیر بوون:** ۱. کاڵ بوون؛ دەبەر کەوتن؛ هەلهلین؛ تەمەن زیاد کردن؛ لە گل کەفتن؛ لە پا کەفتن؛ گەڕانەوە ‹شێخ ڕەزا پیر بووە رووی مەجلیسی یارانی نییە/ ... «شێخ ڕەزا»› ۲. لە ڕێزە کەوتن؛ لە بەر تاوی ڕەنجی زۆر، لە پل‌وپا کەوتن ‹من لە دەستی تۆ پیر بووم› ۳. لە کەڵک کەوتن؛ داچەکان ‹خەیارەکە پیر بووە› ≡ ۱تا۳. پیر شدن

**پیر کردن:** لە ڕێزە خستن؛ کەسێک بە هۆی ئازار دانی زۆر و درێژخایەنەوە، پیر و پەڕپووت کردن ‹کوژرانی مێردەکەی و هەلاتنی منداڵەکانی پیری کرد› ≡ پیر کردن

**پیران / pîran/:** ناو. دۆخی لە سەر خۆ چوون ≡ اغما

◘ **پیران بردنەوە:** ۱. بوورانەوە؛ لە سەر خۆ چوون؛ بێ‌هۆش بوون ۲. بێ‌حاڵ بوون؛ لە هێز کەوتن ۳. توند لە جێی خۆدا خولانەوە ≡ ۱. غش کردن ۲. بی‌حال شدن ۳. چرخ زدن

**پیران کردن:** ۱. بوورانەوە؛ لە سەر خۆ چوون ۲. هەناسە نەهاتنەوە، لە سەرەتای تاوی گریاندا (بۆ منداڵان) ‹ئەو مناڵە پیرانی کرد، دا فوویەکی لێ بکەن!› ≡ ۱. غش کردن ۲. نفس بند آمدن از شدت گریه

**پیرانە**[۱] / pîrane/: ئاوەڵناو. پیرحاڵ؛ سەر بە دەورانی پیری ‹بزەی شیرینی سەر لێوێ/ هەستی پیرانەم دەبزێوێ «هێمن»› ≡ پیرانه

**پیرانە**[۲]: ئاوەڵکار. وەک پیر ‹ژوانی بن سیلە و پەسیوی لاوەتی یادی بە خێر/ بۆ ئەوەی پیرانە نەمرم، یادی دێرینم دەوێ «هێمن»› ≡ پیرآسا

**پیرایشۆکە / pîrayşoke/:** ناو. ۱. جانەوەرێکی چکۆلەی بۆری خڕکەلەیە هێلانە لە بن خۆڵدا دەکا ۲. درووە پوراشێ؛ دڕکێکی شینی سپی‌واشە، باوێلکە دەردەکا ≡ ۱. خرخاکی ۲. خاری است

**پیرایی / pîrayî/:** ناو. پیری؛ پێشوازی؛ کاری بەرەوپیری چوون ‹بچینە پیرایی ساڵی تازەوە›. هەروەها: **چوونە پیراییەوە؛ هاتنە پیراییەوە** ≡ استقبال

**پیربو / pîrbû/:** ☜ **پیرەکورە**

**پیرپنتک / pîrpintik/:** ئاوەڵناو. پیرپەنک؛ بچووکی قسەزل ≡ گُنده گوی خُردسال

**پیرپەنک / pîrpenik/:** ☜ **پیرپنتك**

**پیرپیزاک / pîrpîzak/:** ☜ **پیزپیزاك**

**پیرپیلیک / pîrpîlîk/:** ☜ **پەڵپینە**

**پیرخەنی / pîrxenî/:** ☜ **پیرخەنیلە**

**پیرخەنیلە / pîrxenîle/:** ناو. پیرخەنی؛ شێوی ساواری ورد و شل ≡ آش بلغور ریز

**پیرسۆز / pîrsoz/:** ناو. پیسۆز؛ قوتیلکەی چرای ڕۆن‌گەرچەک و پیو ≡ پیه‌سوز

**پیرک / pîrik/:** ناو. ۱. نەنک؛ دایکی باوک یان دایکی دایک ۲. ماما؛ مامان ۳. جاڵجاڵووکە؛ داوتەنە ≡ ۱. مادربزرگ ۲. قابله ۳. عنکبوت

**پیرکونی / pîrkûnî/:** ناو. [شوورەیی] کەسێک کە لە تەمەنی پیریدا، تۆلازی و کاری جلفانە دەکا ≡ پیر هوسباز

**پیرکی / pîrkî/:** ناو. مامایی؛ مامانی ≡ مامایی

**پیروپاتاڵ / pîr û patał/:** ئاوەڵناو. [پەلار] پیروپاچاڵ؛ پیری کەنەفت؛ پیری زورهان؛ پیری لە کار کەوتوو ‹تاقمێک پیروپاتاڵ بۆ لاوان بڕیار دەدەن!› ≡ پیروپاتال

**پیروپاچاڵ** / pîr û pacał/: ☜ **پیروپاتاڵ**

**پیروخڕ** / pîr û xiř/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* پیروخـەرۆ؛ تەمەن‌درێژ و سلامەت ‹بە پای یەک پیروخـڕ بـن› ▣ پیر و سرحال

**پیروخەرۆ** / pîr û xero/: ☜ **پیروخڕ**

**پیرومەر** / pîr û mer/: نـاو. گرفـت؛ نەخۆشـی هەرس نەبوونی خۆراک و قورس و قەبز بـوون ▣ امتلاء

**پیرۆ** / pîro/: ☜ **پیرو**

**پیرۆز** / pîroz/: ئاوەڵـناو. ممبـارەک؛ مبـارەک؛ شیاوی ڕێز و پەرەسـتن ‹کوردسـتان لای مـن لـە سەرووی هەموو شتێکەوەیە و ڕووگەی هەرە پیرۆزمە و هـەرگیز ڕووم لـەم ڕووگەیـەم وەرنەگێـڕاوە و لـە پەرستنی پاشگەز نەبووم و ناشـبم «هـەژار، چێشـتی مجێور»› ▣ مُقدس

◘ **پیرۆز کردن**: پیرۆزبـایی کـردن ‹بـا گـەورە و کەیخودا لە نـاوا/ پـیرۆزی بکـەن لـە بـووک و زاوا «هەژار، *مەم و زین*»› ▣ تبریک گفتن

**پیرۆزانە** / pîrozane/: نـاو. ١. دیـاری بـە هـۆی سەرکەوتن لە کـار یـان هـەر شـتێکی‌تـرەوە ٢. مبارەکی ▣ ١. شیرینی موفقیت ٢. فرخُندگی

**پیرۆزبـایی** / pîrozbayî/: نـاو. مبارەکبـادی ▣ تبریک؛ تهنیت

**پیرۆزە** / pîroze/: ناو. ١. ممبارەکی؛ مبارەکی ٢. بەردێکی ئاسمانی ڕەنگی بەنرخـە ٣. باڵـدارێکی چیرۆکانە بە سەر هەر کەسدا سێبەر بکا دەبێتـە شـا ‹وەرە ئـۆخژنی سـینەی پـڕ گـڕی مـن!/ وەرە پیرۆزەکـەی بەرزەفـڕی مـن! «هـێمن»› ٤. داڵەسوورە؛ سوورەداڵ؛ سوورەواڵە؛ جۆرێک داڵی گەورەی ئێسک‌خۆرە، چـەن تەڵـە مـووی ڕەش وەک ڕدێن، لە ژێـر چەنـەی هـاتووە، بـەر زگ و سینگی نارنجییە، لە کێوی بەرز و دوورەدەسـت، بە تەنیایی دەژی ▣ ١. فرخُندگی ٢. فیروزه ٣. مُرغ سعادت ٤. هُما

**پیرۆزی** / pîrozî/: ناو. ممبارەکی ▣ مُبارکی

**پیرۆشک** / pîroşk/: نـاو. خلێـرە؛ خـەرخودا؛ داپیرۆشـک؛ داپیرۆکـە؛ پیرێژنۆکـە؛ پیرایشـۆکە؛ پوراشێوکە؛ مامەخۆڵینە؛ کەرەکەوڵە؛ شەگورگانە؛ تیتگەشـوانە؛ چـوس‌گـورگ؛ کەرەجنـە؛ هەرلـە؛ هەرلـە؛ گەنەکەوڵـە؛ خـڕخاکی؛ مـەل‌خـاکی؛ میرووپەکی بۆر و خڕکەڵە، بە لەشی ئاڵقە ـ ئاڵقە، بێ قاپوولکە و زگی کورت و پێی زۆرەوە، گڵ لـە سەر کونەکەی هەڵدەداتەوە ▣ خرخاکی

**پیرۆک** / pîrok/: ☜ **پیرەڵۆك**

**پیرە** / pîre/: دەنگ. ١. نیشانەی ئافەریم و سـەیر مان ‹پیرەگەماڵ گورگی پێ ناوێرێ!› ٢. نیشـانەی تیز و تانە ‹پیرەکەباب چەقۆ نایبڕێ!› ▣ ١. نشانەی تحسین و تعجب ٢. نشانەی تحقیر و تمسخُر

**پیرەباب** / pîrebab/: نـاو. ١. *[مەجاز]* منداڵـی زۆر ژیر و قسەزان ٢. کەیخودا و زانای کۆمـەڵ ▣ ١. کودک فهمیده و خوش‌سُخن ٢. کدخُدای محل

**پیرەبووک** / pîrebûk/: ناو. کۆنەفرتۆڵ ▣ عجوزه

**پیرەپیـاو** / pîrep(i)yaw/: ناو. پیرەمێـرد؛ پیـاوی زۆر بەتەمەن ▣ پیرمرد

**پیـرەدار** / pîredar/: نـاو. داری کـۆن و ڕۆژگـار بەسەرهاتوو ▣ درخت کُهنسال

**پیرەزا** / pîreza/: ئاوەڵناو. تازەمنداڵی پیـاوی پـیر ▣ نوزاد مرد پیر

**پیـرەزاڵ** / pîrezał/: نـاو. پـەنیری لـە نـاو ڕۆنـدا سوورەوەکراو ▣ پنیر سُرخ‌شده

**پیرەژن** / pîrejin/: ناو. پیرێژن؛ ژنی زۆر بە تەمەن ▣ پیرزن

**پیرەژنە** / pîrej(i)ne/: نـاو. زۆفا؛ زلفان؛ گیازلفان؛ گیایەکی بۆنخۆش کە دەرمانە ▣ زوفا

**پیرەک**[1] / pîrek/: نـاو. ژن: ١. مـرۆی مێوینـە ٢. هاوسەری پیاو ▣ ١. زن ٢. زوجه

**پیرەک**[٢]: ئاوەڵناو. چرچ و هەڵگەڕاو لە بەر کۆنی ☚ چروکیده بر اثر کُهنگی

**پیرەکچ** / pîrekiç/: ناو. کچی قەیرە؛ کچی بەتەمەنی شوو نەکردوو ‹هاوسەری تۆ زۆر منالە، جووتی خۆی پەیدا ئەکا/ ساڵێ‌تر گەر شوو نەکەی، ئینجا ئەڵێن پێت پیرەکچ «قانع»› ☚ پیردختر

**پیرەکوڕە** / pîrekuře/: ئاوەڵناو. پیربوو (گژ و گیا) ☚ پیرشده (گیاه و علف)

**پیرەکەمۆ** / pîrekemo/: ناو. ١. [پلار] پیری فێڵباز و ناڕاست ٢. بەئەزموون؛ شارەزا ☚ ١. پیر ناروزن ٢. باتجربه

**پیرەڵۆک** / pîrełok/: ئاوەڵناو. پیتەڵووک؛ پیرۆک: ١. چۆنیەتی هەڵقرچانی پێستی پەنجە کاتێ کە بۆ ماوەیەک لە ئاودا بێ ٢. گەندەڵ و ڕزیو (دار) ☚ ١. حالت چروک برداشتن پوست دست از مجاورت طولانی با آب ٢. کُهنسال و فرسوده (درخت)

**پیرەمەرد** / pîremerd/: ☜ **پیرەمێرد**

**پیرەمێر** / pîremêr/: ☜ **پیرەمێرد**

**پیرەمێرد** / pîremêrd/: ناو. پیرەمەرد؛ پیرەمێر؛ ئیختیار؛ پیاوی زۆر ساڵان بەسەردا چوو ☚ پیرمرد

**پیرهەڤۆک** / pîrhevok/: ناو. دێوەزمە؛ مێردەزمە؛ پیرهەڤی؛ جنۆکەی خەیاڵی کە منالی پێ دەترسێنن ☚ غول بیابانی

**پیرهەڤی** / pîrhevî/: ☜ **پیرهەڤۆک**

**پیری** / pîrî/: ناو. ١. ئیختیاری؛ زورهانی؛ کالی؛ تەمەنداریی زۆر ‹تیری موژگانت لە سینەمدا دەچێ بۆ پیری دڵ/ هێندە کەچاییانە قەسدی خانەدانی دین دەکا «نالی»› ٢. پێشوازی ☚ ١. پیری ٢. پیشوازی

⊡ **بە پیرییەوە هاتن/ چوون**: هاتن/ چوونە پێشوازییەوە ☚ بە پیشواز آمدن/ رفتن

**بەرەوپیری کەسێک چوون**: چوونە پیری/ پێشوازی کەسێکەوە ☚ بە پیشواز کسی رفتن

**چوونە پیری کەسێکەوە**: ☜ **بەرەوپیری کەسێک چوون**

**پیریەتی** / pîryetî/: ناو. کالیتی؛ پیری ☚ پیری

**پیرێ** / pîrê/: سارستە. وشەی بانگ کردنی نەنک یان ژنێکی پیر ☚ عنوانی برای خطاب مادربزرگ یا هر پیرزنی

**پیرێتی** / pîrêtî/: ناو. پیری؛ ئیختیاری ☚ کهولت؛ پیری

**پیرێژن** / pîrêjin/: ناو. ١. پیرەژن ٢. پیرێژنە؛ مێرووەیەکی پانکەڵەی چکۆلەیە لە جێی نەرمان قوولکێک ساز دەکات و خۆی لە بندا حەشار دەدا، مێروو و جانەوەرانی تێ‌دەکەون و بە هۆی هەڵخلیسکان ناتوانن بێنە دەرێ و لێیان وەردەکەوێ و دەیانکێشێتە بن گڵەکەوە و دەیانخوا ☚ ١. پیرزن ٢. حشرەی تاس لغزندە

**پیرێژنانە**[١] / pîrêj(i)nane/: ئاوەڵناو. پێوەندیدار یان بەندیوار بە پیرێژنانەوە ‹بڕوبیانووی پیرێژنانە› ☚ پیرزنانە

**پیرێژنانە**[٢]: ئاوەڵکار. [مەجاز] وەک پیرێژنان ‹خوایە بە عەقڵ ڕێم پێ نەبردی/ پیرێژنانە بڕوام پێ کردی «پیرەمێرد»› ☚ پیرزنانە

**پیرێژنۆکە** / pîrêjinoke/: ناو. پیرۆشک؛ ماسی؛ کەرەکەولە ☚ خرخاکی

**پیرێژنە** / pîrêj(i)ne/: ☜ **پیرێژن ـ٢**

**پیڕاندن** / pîřandin/: چاوگ. پیڕانن؛ پڕماندن؛ پڕمە کردنی ئەسپ ☚ صدا دادن اسب از بینی

**پیڕانن** / pîřanin/: ☜ **پیڕاندن**

**پیڕۆز** / pîřoz/: ناو. متوربە؛ پەیوەن؛ کاری پێوەند کردنی دار ☚ پیوند درخت

**پیڕە** / pîře/: دەنگەناو. دەنگێ لە لووتی گا و ئەسپ دەردێ ☚ صدای بینی گاو و اسب

**پیزاک** / pîzak/: ناو. مێش؛ مۆز ☚ خرمگس

**پیزاڵ** / pîzał/: ناو. پیزڵ؛ گیایەکە بۆ کاغەز دەبێ

و دەیشیچنن ☰ پاپیروس؛ گیاه بَردی
**پیزپیـــزاک** / pîzpîzak/: نـــاو. پیرپیــــــزاک؛ چورەپۆپنەکی ☰ چکاوک کاکُلی
**پیزگ** / pîzig/: ☜ **پیزۆك**
**پیزلوک** / pîzlûk/: ☜ **پیزەرووك**
**پیزڵ** / pîziɫ/: ناو. ۱. پیزاڵ ۲. کلۆش؛ کولـەش؛ قرش؛ لاسکەدەغڵ ☰ ۱. گیاه پاپیروس ۲. سـاقەی غلّه
**پیزڵخ** / pîzɫix/: ☜ **پیزەڵ**
**پیزوەن** / pîzwen/: ناو. دۆخی جومگە وەرگەڕان؛ پێچ خواردنی جومگە ☰ وضع یا حالت پیچ خوردن بند مُچ
**پیزۆک** / pîzok/: ناو. پیـزگ؛ پیشـۆک؛ پیفـۆک؛ هـایلۆک؛ گیـای زەل کـە لـە قـۆپی و زەلکـاودا دەڕوێ ☰ گیاهی باتلاقی
**پیزۆکە** / pîzoke/: ناو. زیپکەی وردیلە لە پێسـت ☰ جوش ریز پوست
**پیزە** / pîze/: ناو. ۱. پز؛ تۆڵ؛ بێچووی نـاوزگ ۲. نەخۆشییەکی ئاژەڵـە، فـزە لـە‌لـووتی دێ ☰ ۱. جنین ۲. نوعی بیماری دام
**پیزەدان** / pîzedan/: نـاو. منالدان؛ جێگەی بێچوو لە زگدا ☰ زِهدان
**پیزەرۆک** / pîzerok/: نـاو. جۆرێ زیپکەی بە ژانـە ☰ نوعی جوش پوستی دردناک
**پیـزەرووک** / pîzerûk/: نـاو. پیزلـووک؛ عـازەبی؛ عازەبە؛ عازەوی؛ جۆش ☰ جوش غرور
**پیـزەڵ** / pîzeɫ/: نـاو. پیزڵـخ؛ پیزەڵـک؛ گیایەکـە لقەکانی بۆ باقەبێن دەبێ ☰ گیاهی بـا سـاقەهـای مناسب برای بسته‌بندی
**پیزەڵک** / pîzeɫik/: ☜ **پیزەڵ**
**پیزی** / pîzî/: ناو. *[شوورەیی]* کۆم؛ کـونی قنـگ ☰ پیزی؛ سوراخ مقعد
**پیزین** / pîzîn/: چـاوگ. فزەفز کردن لە کەپۆڕا ☰ صدا در آوردن از بینی
**پیژ** / pîĵ/: ئاوەڵناو. زۆڵ؛ پیچ؛ بیژوو ☰ حرامزاده
**پیژاڵ** / pîĵaɫ/: ناو. ئالف ☰ علف
**پیژۆک** / pîĵok/: ☜ **پیژۆکی**
**پیژۆکـی** / pîĵokî/: نـاو. پیـژۆک؛ پووشـەک ☰ زعفران وحشی
**پیس**[۱] / pîs/: ناو. گول ☰ جُذامی
**پیس**[۲]: ئاوەڵناو. ۱. گلاو؛ چەپـەڵ؛ پۆخـل؛ پـۆخل؛ زیرگن؛ چلکن؛ چرکن؛ چڕگەن؛ چڕکین؛ گـەمار؛ گنار؛ گەڤار؛ گەن؛ گەندلخە؛ گۆڵ؛ پەلۆخ؛ پلتۆخ؛ ناپوخت؛ نەپاک؛ تـەنوا؛ ژەژ؛ قرێـژ؛ قـەرێژ؛ قلێـر؛ قەلێر؛ قز؛ قژپۆغ؛ لیتۆکە؛ ڕیقن؛ پت‌پێس؛ پڕپێس ۲. گەنیو (هێلکە) ۳. *[مەجاز]* ڕژد و دەس‌قووچـاو ☰ ۱. چرکین ۲. فاسد (تخم‌مرغ) ۳. خسیس
⊡ **پیس بوون**: ۱. چەپـەڵ بـوون ۲. گـەنین یـان خراپ بوونی شتێ ☰ ۱. کثیـف شـدن ۲. فاسـد شدن
**پیس کردن**: ۱. گەنانـدن ۲. چەپـەڵ کـردن ۳. تەنینەوە و مەترسیدار بوون (نەخۆشی) ‹لە مـن دەکەی بچۆ دوکتور هەتا لێی پیس نەکردووی› ☰ ۱. فاسد کردن ۲. کثیف کردن ۳. مُزمن شدن
**پیس**[۳]: ئاوەڵکار. ۱. زۆر توند؛ تیژ ‹پیس گەرمە› ۲. خراپ ‹پیس پێوەبووم› ☰ ۱. بی‌اندازه ۲. بد جور
**پیسار** / pîsar/: نـاو. پۆن؛ حەیز؛ سـووڕی مانگانـە ☰ قاعدگی
**پیسایی** / pîsayî/: نـاو. ۱. گـەماری؛ چەپەڵـی ۲. *[مەجاز]* پیسی؛ ڕیاوی مرۆ ☰ ۱. کثافات ۲. مدفوع
**پیس‌پیسـۆک** / pîspîsok/: نـاو. پەسپەسەکۆڵـە؛ هەڵەپەزە؛ مێرووپەکی زەردی چنگ قـرژە، وەک جالجالۆکەی زل دەچێ ☰ رُتَیل
**پیسترک** / pîstirk/: ☜ **پەیژە**
**پیستور** / pîstûr/: ئاوەڵناو. زاڵم؛ زۆردار ☰ ستمگر
**پیس‌خـۆر** / pîsxor/: ئاوەڵـــناو. گەنــــدەخۆر؛

تایبەتمەندی کەسێ کە خۆراکی خراپ دەخوا بدخوراک

**پیس‌کراو** / pîsk(i)raw/: ئاوەڵناو. لەوتی؛ پیس آلوده

**پیسکە** / pîske/: ئاوەڵناو. چرووک؛ ڕژد؛ دەس‌قووچاو؛ ڕەزیل خسیس

**پیسکەیی** / pîskeyî/: ناو. ڕژدی؛ چرووکی خِسّت

**پیس‌نووس** / pîsnûs/: ☜ **پێش‌نووس**

**پیسۆ** / pîso/: ناو. بۆسۆ؛ بۆنی پەمووی سووتاو بوی پنبه‌ی سوخته

**پیسۆز** / pîsoz/: ناو. قوتیلە؛ چرای ڕۆن گەرچەک پیه‌سوز

**پیسۆڵ** / pîsoł/: ئاوەڵناو. *[پلار]* پیسۆڵانە؛ لەڕ و لاواز و مردارەوبوو ‹ئەو بەرخە پیسۆڵە چییە هێناوتە؟› لاغر مُردنی

**پیسۆڵانە** / pîsołane/: ☜ **پیسۆڵ**

**پیسە** / pîse/: ئاوەڵناو. بازە؛ دوو ڕەنگی ڕەش و سپی خلنگ

**پیسەکە** / pîseke/: ئاوەڵناو. نابووتە؛ پووتەکە؛ قرخنە کوتاه‌قد لاغر بدقواره

**پیسی** / pîsî/: ناو. ١. گەماری؛ چەپەڵی ٢. نەخۆشی گولی ٣. *[مەجاز]* پیسایی؛ ڕیاوی مرۆ ١. پلیدی ٢. جُذام ٣. مدفوع

**پیسێر** / pîsêr/: ناو. نێفەکی دەرپێ خشتک پیژامه

**پیش** / pîş/: ناو. ١. هەناسە؛ نەفەس ٢. پووش؛ وشکەگیا ١. دم؛ نفس ٢. گیاه خشک

⊡ **پیش خواردنەوە:** مشەمش هاتن لە ڕکان ‹کل لە ڕەشی چاو سڵ ئەکاتەوە/ قەتران لە زوڵفت پیش ئەخواتەوە «فولکلۆر»› نفس گرفتن از خشم

**پیش دان:** پشوو دان استراحت کَردن

**پیش کردن:** ڕک خواردنەوە؛ دەرنەبرینی تووڕەیی خودخوری کردن

**پیشان**[1] / pîşan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //پیشای؛ دەپیشێ؛ بپیشێ// پیشیان؛ پیشیای؛ بە تین و تاوی ئاگر پێ گەیشتن کفیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: پیشاو/ چاوگی نەرێنی: نەپیشان

**پیشان**[2]: ناو. نیشان؛ تماشا نشان

⊡ **پیشان دان:** نیشان دان ‹نەفی و ئیسباتە کە زیکری ڕێ بە حەق پیشان ئەدا/ وا منیش ڕێبواری ئەو ڕێیەم، خودا بمکەی بەڵەد «بێخود»› نشان دادن

**پیشان دران:** نیشان دران نشان داده شدن

**پیشاندن** / pîşandin/: چاوگ. تێپەڕ. //پیشاندت؛ دەپیشێنی؛ بپیشێنە// پیشانن؛ پیشنای؛ ناوەرۆک بە تینی ئاگر پێ گەیاندن ‹پەتاتەیەکم پیشاند› در مجاورت آتش گذاشتن و پُختن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپیشاندن

**پیشاندەر** / pîşander/: ئاوەڵناو. نیشاندەر؛ بەرچاوخەر نشان‌دهنده

**پیشانگا** / pîşanga/: ☜ **پیشانگە**

**پیشانگە** / pîşange/: ناو. پیشانگا؛ نمایشگا؛ نیشانگە؛ ڕانگە؛ جێگەی ڕانان نمایشگاه

**پیشانن** / pîşanin/: ☜ **پیشاندن**

**پیشاو** / pîşaw/: ئاوەڵناو. پیشیاو؛ پیشیاگ؛ پوختەکراو بە تینی ئاگر کفیده؛ پُخته در مجاورت آتش

**پیشخۆرەوە** / pîşxorewe/: ئاوەڵناو. *[پلار]* ١. ڕکن؛ قینەون ٢. بە تایبەتمەندی تووڕەیی و ناڕاحەتی دانە ناو خۆ ١. کینه‌توز ٢. تودار

**پیشقان** / pîşqan/: چاوگ. فیشقان؛ فیکە لە لووتەوە هاتن لە ترسان یان لە ڕکان صدا از بینی درآمدن از ترس یا از خشم

**پیشقاندن** / pîşqandin/: چاوگ. تێنەپەڕ.

//پیشقاندت؛ دەپیشقێنی؛ بپیشقێنە// فیشقە کردن ☰ صدا دادن از بینی

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپیشقاندن

**پیشقە** / pîşqe/: دەنگ. دەنگی هەناسە لە لووتەوە ☰ صدای نفس از بینی

⊡ **پیشقە هاتن**: *[کینایە]* زۆر کەیفساز و بەدەماخ بوون ☰ بسیار شادمان بودن

**پیشقەپیشق** / pîşqepîşq/: دەنگەناو. پیشکەپیش؛ دەنگی لووتی گامێش ☰ صدای بینی گاومیش

**پیشک** / pîşk/: ناو. ١. ☜ **پیشکان** ٢. چەڵتووکی نەکوتراو ☰ ١. ☜ **پیشکان** ٢. شالی

**پیشکان** / pîşkan/: ناو. پیشک؛ پیشکەقەزان؛ بێڵەکان؛ بێرکی گیا کەندن ☰ بیلچەی باغبانی

**پیشکەپیش** / pîşkepîş/: ☜ **پیشقەپیشق**

**پیشکەقەزان** / pîşkeqezan/: ☜ **پیشکان**

**پیشگان** / pîşgan/: ناو. قلچک؛ ئامرازی قنگر و بنەگیا دەرێنان ☰ بیلچەی باغبانی

**پیشن** / pîşin/: ئاوەڵناو. ڕکن؛ قینەون؛ ڕکەون ☰ کینەای

**پیشنای** / pîşnay/: ☜ **پیشاندن**

**پیشۆ** / pîşo/: ناو. پووشوو؛ قاوە؛ ئاگرگرە ☰ آتشگیره

**پیشۆک** / pîşok/: ناو. ١. ☜ **پیزۆک** ٢. گوێماسیلکە ☰ ١. ☜ **پیزۆک** ٢. صدف

**پیشە** / pîşe/: ناو. ١. سنعات؛ کاری بەرهەم هێنان بە گوێرەی ڕەوش، ئامۆژە و قانوونی تایبەت بە خۆی ٢. کار؛ کسم ‹پیشەی سەگ، وەڕینە› ٣. *[مەجاز]* ئاکار؛ کردەوە ‹سەوداسەری پیشەیان بوو گشتی/ بەستبوونی ئەوین بە داوی گشتی «هەژار، *مەم و زین*»› ☰ ١. صنعت ٢. پیشە ٣. رفتار

**پیشەساز** / pîşesaz/: ناو. سنعاتکار ☰ صنعتگر

**پیشەسازی**[1] / pîşesazî/: ناو. سنعات: کسب؛ کسپ؛ کرگار: ١. کاری بەرهەم هێنان بە گوێرەی ڕەوش، ئامۆژە و قانوونی تایبەت بە خۆی ‹با تەوژمی فیکر و زانین و هونەر/ یەک بخەین بۆ پیشەسازی نیشتمان «قانع»› ٢. شێوە و شێواز و بنەمای وەها کارێک ☰ ١. کار صنعتی ٢. صنعت

**پیشەسازی**[2]: ئاوەڵناو. ١. سەر بە سنعات ٢. خاوەن پیشەیەکی پێشکەوتوو ☰ ١و ٢. صنعتی

**پیشەکار** / pîşekar/: ناو. پیشەساز ☰ صنعتگر

**پیشەگەر** / pîşeger/: ناو. پیشەساز ☰ صنعتگر

**پیشەوەر** / pîşewer/: ناو. ١. پیشەساز ٢. دووکاندار ☰ ١. پیشەور ٢. مغازەدار

**پیشیاگ** / pîşyag/: ☜ **پیشاو**

**پیشیان** / pîşyan/: ☜ **پیشان**[1]

**پیشیاو** / pîşyaw/: ☜ **پیشاو**

**پیشیای** / pîşyay/: ☜ **پیشان**[1]

**پیف**[1] / pîf/: ئاوەڵناو. هەڵمساوی فووکراوی شلوشەوێق ☰ پُف‌کرده

**پیف**[2]: دەنگ. وشەی بێزاری دەربڕین لە بۆنی گەن ☰ پیف

**پیفدانک** / pîfdanik/: ناو. پفدانک؛ تیزانگ ☰ بادکُنک

**پیفک** / pîfik/: ناو. پیفی؛ پیفە؛ پیفۆ ☰ آتش‌افروزنه

**پیفۆ** / pîfo/: ☜ **پیفك**

**پیفۆک** / pîfok/: ☜ **پیزۆك**

**پیفە** / pîfe/: ☜ **پیفك**

**پیفی** / pîfî/: ☜ **پیفك**

**پیفیاگ** / pîfyag/: ئاوەڵناو. پووچەڵ؛ بێناوک ☰ پوچ؛ میان تُهی

**پیفێ** / pîvê/: ناو. قەو؛ چەشنێ قارچکی نەرمە، خەڵکی دەشتەکی بۆ هەڵکردنی ئاور بەکاریان دێنا ☰ نوعی قارچ

**پیڤ** / pîv/: ناو. پیو؛ چەورایی ناوزگ ☰ پیه

**پیڤاز** / pîvaz/: ☜ **پیاز**

**پیڤان** / pîvan/: ☜ **پێوان**

**پیڤسۆز** / pîvsoz/: ناو. بێسووس؛ چرای بەرێ کە پیویان تێ دەکرد ☰ چراغ پیه سوز

**پیڤیر** / pîvîr/: ناو. گیایەکی بەرزەبالایە، بە وشکی دە ناو کورتانی دەئاخنن ☰ گیاهی است

**پیق** / pîq/: ناو. پیک؛ زمانەی سەری زوڕنا ☰ نر- مادەی سُرنا

**پیقاندن** / pîqandin/: چاوگ. پیقە لە شتێ هەستاندن ☰ نوعی صدا همچون صدای سُرنا ایجاد کردن

**پیقل** / pîqil/: ناو. داری ژارەماسی ☰ درخت زهرماهی

**پیقنە** / pîqne/: ناو. فیقە؛ فیکفیکە ☰ سوتَک

**پیقە** / pîqe/: دەنگەناو. دەنگی وەک هەرای زوڕنا ‹زوڕناچی پیقەی زوڕنا دەردێنێ/ سێ جار لە سەر یەک پیا ئەچەقێنێ «قانع»› ☰ صدایی چون صدای سُرنا

**پیک** / pîk/: ناو. ١. ☜ **پیق** ٢. کوتکی ئاسن ٣. لاسکی کلۆری گیا ٤. زەنبوورەی ئاش ٥. خالی وەرەق بە وێنەی دڵێکی پێچەوانە و دەستەدار ☰ ١. ☜ **پیق** ٢. پُتک آهنی ٣. ساقەی کاوک ۴. سوراخ تنگ ناو آسیاب ۵. پیک ورق

**پیکۆل** / pîkol/: ناو. ١. هەوڵ؛ تێکۆشین ٢. خەبات ☰ ١. تلاش ٢. مُبارزە

**پیکیەی** / pîkyey/: چاوگ. هەنگێوران؛ پێکیان ☰ مورد اصابت قرار گرفتن

**پیل** / pîl/: ناو. ١. شان و سەرقۆڵ ‹لە شان و پیل کەوتم!› ٢. پەل؛ دەست و پێ بە جیا ‹لە پاش ئەو لە لای کوڕگەلی مەرد و ڕەند/ بە ئاواتی گەنج ڕاوەشا پیل و زەند «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ٣. دراو؛ پارە؛ پووڵ ‹پیل نەیرم!› ٤. پرد؛ پێڵ ٥. باتری وشک ☰ ١. کِتف ٢. هر یک از چهار دست و پا ٣. پول ۴. پُل ۵. باطری؛ پیل

⊡ **پیلوشان لە هەش نان:** شانوپیل لە هەش نان؛ تازیە گرتن؛ شینگێڕی کردن ‹با لە قوڕ نیشێ و لە هەش نێ دوژمنی وان پیلوشانی/ چوونکوو ئەوڕۆ یەکتری گرت کورد و ئازربایجانی «هێمن»› ☰ عزا گرفتن

**پیلاڕەش** / pîlařeş/: ناو. جەرگ؛ جەگەر ☰ جگر

**پیلاسپی** / pîlasipî/: ناو. سی؛ جەرگی سپی ☰ ریه

**پیلاڤ** / pîlav/: ☜ **پلاو**

**پیلان** / pîlan/: ناو. پلان: ١. نەخشەی کار ‹بۆ دزی سەلکێ پەنیر/ کەوتنە پیلان و تەدبیر «بێکەس»› ٢. کەینوبەین بۆ فێڵبازی ‹بۆ حەلالە مالی کورد و بۆچی فەرزە کوشتنی؟!/ دەک خەجالەت بێ درۆزن! چۆن وەها پیلان ئەکا؟ «قانع»› ٣. گەڕ؛ گزی؛ فێڵ ٤. ئاژاوە؛ ئاژاولە؛ بشێوە ٥. پەلپ؛ بیانوو؛ بەهانە ☰ ١. طرح ٢. توطئە ٣. دغلبازی ۴. آشوب ۵. بهانه

⊡ **پیلان گێران/ ڕشتن:** کەوتنە پیلان؛ کەین و بەین کردن؛ کەلەکوکولۆک ساز کردن ☰ توطئە چیدن

**کەوتنە پیلان:** ☜ **پیلان گێران**

**پیلانباز** / pîlanbaz/: ناوەڵناو. حیلەباز؛ گەڕباز ☰ حُقەباز

**پیلانکەر** / pîlanker/: ناو. *[کینایە]* ڕاسپاردەی مالی زاوا بۆ مالی بووک پێش زەماوەند ☰ قاصدِ خانەی داماد بە خانەی عروس، قبل از عروسی

**پیلانگێڕ** / pîlangêř/: ناوەڵناو. ئاژاوەچی؛ مایەی هەرا و کێشە ☰ آشوبگر

**پیلبڕ** / pîlbiř/: ناوەڵناو. دەسبڕ؛ فێڵباز؛ ساختەچی ☰ کلاهبردار

**پیلپێلک** / pîlpêlik/: ☜ **پەپوولە**

**پیلک** / pîlik/: ناو. ١. پۆستەچی؛ نامەبەر ٢. پل؛

ئەنگوست؛ قامک ☰ ۱. پیک ۲. انگشت

**پیلکە** / pîlke/: ناو. ۱. پلـتۆک؛ پتـە؛ پیتکـە ۲. پەلەپیتکە ‹پەنجەی کینە لە سەر پیلکـەی تفـەنگ کەوتە کار/ کۆستی دڵی بۆ ئێجگـاری کـەوت کچـی جووتیار «گۆران»› ☰ ۱. تلنگُر ۲. ماشه

**پیلۆ** / pîlo/: ☜ **پێڵو**

**پیلو** / pîlû/: ☜ **پێڵو**

**پیلە** / pîle/: ناو. ۱. بیـانوو؛ بیانـک؛ بەهانـە ۲. کێشە؛ چەنەبازیی زۆر ۳. ماڵی کرمـی هاوریشـم ☰ ۱. بهانه ۲. جَدَل ۳. پیلەی کرم ابریشم

**پیلەک** / pîlek/: ناو. ۱. دوگمە؛ قۆبچە؛ بشکوژ ۲. پوولەکە؛ ئۆییە؛ بریقە ☰ ۱. دُگمه ۲. پولک زینتی

**پیلەکە** / pîleke/: ناو. پوولەکـە؛ بریقـە ☰ پولـک زینتی

**پیلەگر** / pîlegir/: ناوەڵـناو. بیـانووگر؛ بەبەهانـە؛ کێشەکەر؛ گرووگر ☰ بهانەگیر

**پیلەگیر** / pîlegîr/: ☜ **پەڵپگر**

**پیلەوەر** / pîlewer/: ☜ **پێڵەوەر**

**پیلیسک** / pîlîsk/: ناو. هەل؛ دەرفەت ☰ فُرصت

**پیم** / pîm/: ناو. پیو؛ پیڤ؛ چـەورایی نـاو زگ ☰ پیه

**پیمای** / pîmay/: چاوگ. پێوان؛ پیمـەی؛ ئەنـدازە گرتن؛ قەرساندن ‹زێدم چۆڵ و ماوام بەرۆ پیمۆنۆمۆ پەی تە هەڕۆ/ تا کەی ئەڤـداڵ مشـیۆ بـەرۆ بـەرگ و لەشیم دەوارەنێ «سەیدی»› ☰ اندازه گرفتن

**پیمەی** / pîmey/: ☜ **پیمای**

**پیمیای** / pîmyay/: چـاوگ. پێـوران؛ قەرسـان ☰ اندازه شدن

**پیندەڤـە** / pîndeve/: نـاو. ڕیخـــی ســـــواغی خەڵێفەمێش ☰ برموم

**پینک** / pînik/: ناو. هێلانە؛ هێلان ☰ آشیانه

**پینگاڤ** / pîngav/: ناو. هەنگاو؛ شەقاو ☰ قدم؛ گام

**پینگپۆنگ** / pîngpong/: ناو. تاولـە؛ یـاری تـۆپی سەر مێز ☰ پینگ‌پنگ

**پینۆک** / pînok/: نـاو. پینــەک؛ خەونووچکــە ☰ پینکی

**پینە** / pîne/: ناو. ۱. پنوو؛ پنی؛ پارچەیەک کە بە سـەر دڕاویـدا دەیـدروون ‹نەیانهێڵـم دەبـێ لـەو سەرزەمینە/ لە شانم دادڕم ئەو پینە شینە «هێمن»› ۲. پـۆڕگ؛ پۆلکــە؛ گــوڕاو؛ تــوێخی ڕەق و ڕووش- ڕووش کـە بـە هـۆی کـاری زۆرەوە لـە بەری دەست و پێ، ئەژنۆ یـان مەچەکـدا بـەدی دێ ۳. ☜ **پونە** ٤. کەپـەکی ئـارد ٥. پینـەک؛ خاسەسی؛ شاقاز؛ قەبەغاز ٦. پینەهەور؛ پەڵەهەور ☰ ۱. پینه؛ وصله ۲. پینەی دسـت ۳. ☜ **پونـە** ۴. نُخاله ۵. غاز خاکستری ۶. لکەی ابر

⊡ **پینە کردن**: ۱. پارچـە بـە سـەر جـل‌وبـەرگی دڕاودا گــرتن ۲. *[کینایـە]* داپۆشــینی هەڵــە و عەیب ‹بۆم پینە بکەن هەڵەی زەمانم/ بـا بێننـەوە بیر منیش لەوانم «هەژار، *مەم و زین*»› ☰ ۱. پینه کردن؛ وصله کردن ۲. عیب پوشیدن

**پینەپەڕۆ** / pînepeřo/: ☜ **پینەوپەڕۆ**

**پینـەچی** / pîneçî/: نـاو. پینــەدروو؛ پینــەدۆز؛ پینەساز؛ مشەقە؛ کەسێ پیشەی پینە کردنـە ☰ پینەدوز

**پینەدروو** / pined(i)rû/: ☜ **پینەچی**

**پینەدۆز** / pînedoz/: ☜ **پینەچی**

**پینەساز** / pînesaz/: ☜ **پینەچی**

**پینەک** / pînek/: ناو. ۱. پینۆک؛ خەونووچکـە ۲. خاسەسـی؛ شـاقاز؛ قەبـەغاز ☰ ۱. پینکـی ۲. غـاز خاکستری

**پینەکی** / pîekî/: ناو. کوتکەخەو؛ وەنەوز ☰ چُرت

**پینەوپـەڕۆ** / pînewpeřo/: نـاو. پینەپــەڕۆ: ۱. پینــەی لــە قومــاش ۲. گۆترەکــاری؛ کــاری بــە سەرچڵی ‹نە پارەم هەیە نە هێزی ئـەژنۆ/ نـە کـارم پێک دێ بە پینە و پـەڕۆ «مـوفتی پێنجـوێنی»› ۳.

خاسەسی ☰ ١. پینەکاری ٢. سرهم‌بندی ٣. غاز خاکستری

**پینەوپەڕۆ**[٢]: ئاوەڵناو. ناتەواو؛ سەروپاشکاو؛ دەس‌وپا شکیاگ؛ چەکنتی ‹کاری پینەوپەڕۆ ناگاتە نیوەڕۆ «مەسەل»› ☰ شکسته بسته

**پینەهەور** / pînehewr/: ☜ پینە

**پینی** / pînî/: ناو. ١. کەپەک؛ بن‌بێژنگ ٢. شیوی هێلکە و خورما و هەنگوین ☰ ١. سبوس؛ نُخالە ٢. خوارک تخم مرغ و خرما و عسل

**پیو** / pîw/: ناو. پیڤ؛ چەورایی ناو زگ ☰ پیه

**پیوار** / pîwar/: ☜ پێوار

**پیواز** / pîwaz/: ☜ پیاز

**پیوازاو** / pîwazaw/: ☜ پیازاو

**پیوازۆکە** / pîwazoke/: ☜ پیوازەسەگانە

**پیوازەسەگانە** / pîwazesegane/: ناو. پیوازۆکە ☰ گیاهی است

**پیوسۆز** / pîwsoz/: ناو. چرای پیسۆز ☰ پیه‌سوز

**پیویای** / pîwyay/: چاوگ. بینران؛ دیتران ☰ دیده شدن

**پیوو** / pîwû/: ☜ پدوو

**پیە** / p(i)ye/: ناو. بەز؛ پیو ☰ پیه

**پیەرز** / p(i)yer(i)z/: ناو. پارێز ☰ پرهیز

**پیەڵگ** / p(i)yeĥig/: ☜ پێڵوو

**پیەن** / p(i)yen/: ☜ پان

**پیەنای** / p(i)yenay/: ☜ پانایی

**پیەنی** / p(i)yenî/: ☜ پانایی

**پییە** / pîye/: ناو. پیو؛ چەورایی ناوزگ ☰ پیه

**پییەنا** / pîyena/: ☜ پانا

**پێ**[١] / pê/: ناو. ١. ناوی پیتی چوارەمی ئەلفوبێی کوردی ٢. لاق؛ قاچ؛ پا ٣. پا؛ فووت؛ ئەندازەی یەک پێ ٤. دارێکە لە ئاسیاودا بەرداشی پێ بەرز دەکەنەوە ٥. پەلەپیتکەی چەکی ئاگرین ٦. ☜ پدوو ☰ ١. پ؛ نام حرف سوم الفبای زبان کردی ٢. پا ٣. پا؛ فوت ۴. ابزاری در آسیاب ۵. ماشه‌ی اسلحه ۶ ☜ پدوو

◙ **بەپێی**: بە هۆی ☰ به موجب

**بەو پێیە**: ١. بەو بۆنەوە؛ کەوابوو ‹جا بەو پێیە دەبێ ئێستا دار بەرووی بنەتاڵوو بم، یەک تەنیشتی چوارپاڵوو بم› ٢. بەو شێوەیە؛ هەر ئاوا؛ هەر بەم جۆرە ‹بەو پێیە بڕۆنە پێشێ قەتتان بۆ تەواو نابێ› ☰ ١. به موجب آن ٢. بدین ترتیب

◘ **پێ بە جەرگی خۆدا نان**: *[مەجاز]* پێچەوانەی خواست و ویستی دەروونی کارێک کردن ☰ پا روی دل خود گذاشتن

**پێ بە سەردا ساوین**: *[کینایە]* سەری نانەوە؛ باسی نەکردن؛ دەنگی دەرنەهێنان ‹ئەم جاریش وەکوو جارەکانی تر، پێیان بە سەردا ساوی و دەر نەکەوت ئەو دزییە گەورە کێ لە پشتییەوە بوو› ☰ صدایش را در نیاوردن

**پێ پێوەنان**: *[کینایە]* زۆر بە پەلە غاردان؛ بلەز ڕاکردن؛ هەڵاتن بە تاو ‹نازانم چۆن خۆم گەیاندە ئەسپەکەم و سوار بووم و پێم پێوە نا و لە سەر جلەوان چوومەوە ماڵ «هێمن»› ☰ با شتاب رفتن

**پێ تێخستن**: *[کینایە]* پێ خستنە نێو شتێکەوە؛ ئاڵۆز کردن (زۆرتر بۆ پیس کردن یان نەکردنی ئەو کارە دەگوترێ) ‹با پێی تێنەخەین ئەو خوێنە گەشە/ چون یادگاری ڕۆژێکی ڕەشە «قانع»› ☰ لگدمال کردن

**پێ چەقاندن**: *[کینایە]* پێ داگرتن؛ سوور بوون لە سەر کارێک ☰ پافشاری کردن

**پێ خستن**: *[کینایە]* لە پێ کەوتن؛ چیتر نەتوانین بەڕێوە چوون ‹کێوی هیجرت خستە سەر شانی دڵم پێی خستووە/ تا نەگا دەستی بە زوڵفت زەحمەتە هەستێتەوە «حەریق»› ☰ از پا افتادن

**پێ داکێشان**: ☜ پا داکێشان

**پێ داگرتن**: *[مەجاز]* ١. مان گرتن ٢. سوور بوون

لـە سـەر مەبەسـت ⊠ ١. اعتصـاب کـردن ٢. پافشاری کردن

**پێ ڕاکێشان:** ١. پا درێژ کردنەوە؛ حەسـانەوە ٢. لە سەر ڕۆیشتن و خۆ تێوەردان ‹هێنـدەی پـێ ڕاکێشا هەتا هەموو لێ وەدەنـگ هـاتن› ⊠ ١. پـا دراز کردن (جهت استراحت) ٢. لجاجت کردن

**پێ کردنـەوە:** *[کنایـە]* پـا کردنـەوە؛ یەکـەم بانگهێشتی بـووک و زاوا بـۆ مالـێک ⊠ پاگُشـا کردن

**پێ گرتن:** ☜ پا گرتن

**پێ لێنان:** *[مەجاز]* دان پێدا نان؛ مل پیا کردن ⊠ اعتراف کردن

**پێ لێ نەبرین:** *[کنایە]* بـەردەوام و زوو بـە زوو سەردان ⊠ مُداوم سر زدن

**پێ لێ هەڵبرین:** *[مەجاز]* ئەو پەڕی بێحـەیایی و بێشەرمی نواندن ⊠ شورش را درآوردن

**پێ لێ هەڵێنان:** *[مەجاز]* چـاو و ڕوو کرانـەوە ⊠ سر و گوش جُنبیدن

**پێ وە عەرز نەکەوتن:** *[مەجاز]* بریتی لە شـادی و کەیفخۆشـی بـێحەسـاو ⊠ در پوسـت خـود نگنجیدن

**پێی زیادی داکێشان:** *[کنایە]* زێدەڕۆیی کـردن ⊠ زیادەروی کردن

**پێ**[۲]: ئاوەڵکار. لەگەڵ؛ لەیەل؛ لەتەک؛ لە لا ‹چـت پێیە؟› ⊠ همراه

⊡ **پێ مان:** لە دەستدا بوون ‹پارەمان پێ ماوە؟› ⊠ همراه ماندن

**پێ**[۳]: جێنـاو. بەو؛ بە ئەو ‹پێ بێژە!؛ پێـت دا؟› ⊠ بـە او؛ بدو

⊡ **پێ چاران:** چارە کردن؛ مشوور خـواردن ⊠ بـە فکر بودن

**پێ سەیر بوون:** بـە نائاسـایی زانـین ⊠ عجیـب دانستن

**پێ کران:** ١. پێ جێبـەجێ بـوون؛ لـە دەسـت هاتن ٢. ئاوا بۆ چـوون ‹گەمـەی تۆشـم بـە لاوە سەهلە خوێڕی!/ گەلێکم پـێ کـراوە لـەو گەمانـە «هێمن»› ٣. ناچار کران بۆ کردنی کارێک ‹بـە دلـی خـۆم نـەبوو، پێیـان کـردم› ⊠ ١. در تـوان داشتن ٢. بر سر آمدن ٣. وادار به کاری شدن

**پێ وا بوون** وا زانین؛ ئـاوا بـۆ چـوون ‹ئەوەنـدە دەردەدار و بێ پەرستارم کـە پـێم وایـە/ لـە سـەر کێلـی تەمـەن هەڵـناکرێ تـازە شـەمێکی تـر «هێمن»› ⊠ چنین پنداشتن

**گوێ پێ نەدان:** ١. گوێ (لە کەسێ) نـەگرتن ٢. بایەخ پێ نەدان ‹ئەم نەخۆشییەت، هێندە گـوێ پێ مەدە! ئیشەڵـلا هـیچ نییـە› ⊠ ١. گـوش (بـە حرف کسی) ندادن ٢. اهمیّت ندادن

**پێ**[۴]: ئامراز. ١. بەو؛ بە ئەو ‹پێ بێژە!؛ وتوو پـێ؟› ٢. لە لا؛ بە لای خۆ ‹پێم بـاش نـەبوو› ٣. نیشـانەی خاوەندارێتی ‹پارەت پێیە؟› ⊠ ١. بە او؛ بدو ٢. بـە نظر ٣. حرف مالکیت

⊡ **پێ بوون:** ١. لە لا هەبوون ‹هیچم پێ نەبوو› ٢. پێویست بوون (لە شێوازی نەرێنیدا دەچێتە کـار) ‹پێ ناوێ بۆ شـەهیدی وەتـەن شـیوەن و گـرین/ نامرن ئەوانە وا لە دلی میللەتا ئەژین «پیرەمێرد»› ⊠ ١. داشتن ٢. لازم بودن

**پێ خۆش بوون** دڵ پێوە بوون ‹چتان پـێ خۆشـە لێ نێم؟› ⊠ دوست داشتن

**پێ گران بوون** بە زەحمـەت زانـین ‹پـێم گرانـە سەری بۆ دانەوێنم› ⊠ دشوار آمدن

**پێ**[۵]: پێشـگر. ١. نـاوی چـاوگ و چـاوگ سـاز ‹پێفرۆش؛ پێکـردن؛ پـێکـەوتن› ٢. دێتـە سـەر هەندێک ڕەگی کارەوە و نـاو و نـاوی ئـامێر سـاز دەکـات ‹پێنـووس؛ پێخـەف؛ پێگـر؛ پێنـاس› ٣. دەچێتە سەر زۆرێک چاوگەوە (سادە و لێکـدراو) و ماناکەیان بە خۆوە دەبەسـتێتەوە (ڕوون کردنـەوە:

«پێ» لێرەدا بە مانای: «بە شتێ»، «کەسێ» یان «بارودۆخێ» دێت) ‹پێگەییشتن؛ پێگەیاندن› ٤. دەلکێتە ڕەگی کارەوە و ئاوەڵناو یان مورفیمی قامووسی دیکە ساز دەکات ‹پێزان؛ پێنەزان؛ پێگەییشتوو› ≡ پیشوند سازندەی: ١. مصدر و اسم مصدر ٢. اسم و اسم آلت جدید ٣. مصدر مرکب جدید ۴. صفت

| | | |
|---|---|---|
| پێبران | پێبژاردن | پێچاران |
| پێحەسان | پێخورین | پێداخستن |
| پێدادان | پێداکردن | پێداگرتن |
| پێداگیران | پێدالەقان | پێدامالین |
| پێدامالین | پێدان | پێدانەوە |
| پێدانان | پێداهاتن | پێداهاتنەوە |
| پێداهێنان | پێڕاگەیاندن | پێزانین |
| پێسپاردن | پێسەلماندن | پێکران |
| پێکردن | پێکەوتن | پێگەیاندن |
| پێگەییشتن | پێنازین | پێناسان |
| پێناساندن | پێهەڵپرژان | پێهەڵپژان |
| پێهەڵپەساردن | پێهەڵچوون | پێهەڵکالان |
| پێهەڵکالین | پێهەڵکەوتن | پێهەڵگرتن |
| پێهەڵگران | پێهەڵگوتن | پێهەڵمیزتن |
| پێهەڵمیزین | پێهەڵچوونەوە | پێهەڵگیران |
| پێکێشان | پێکێشاندن | پێکێشران |

**پێ**[6]: ↓

⊡ **پێ بوون:** ئاییسان ‹ئاگرەکە پێ بوو› ≡ مُشتعل شدن

**پێ خستن:** هەڵکردنی ئاگر ‹ئاگرێکی باشمان پێ خست و گەرم بووینەوە› ≡ آتش برپا کردن

**پێ کردن:** هەڵکردن ‹چراکە پێ کە!› ≡ افروختن

**پێباز** / pêbaz/: ناو. پردەباز؛ بەردەباز؛ بگار؛ بەردی پەڕینەوە لە باتی پرد ≡ گُدار

**پێبازە** / pêbaze/: ناو. گیایەکە ≡ گیاهی است

**پێبرن** / pêbirin/: چاوگ. شوێن گیران؛ دوای شۆپ کەوتن ≡ ردگیری کردن

**پێبڕ** / pêbiř/: ئاوەڵناو. زۆر قووڵ؛ پەی نەدەر ≡ بسیار ژرف

**پێبڕان** / pêb(i)řan/: چاوگ. بەر کەوتن؛ بە نسیب بوون ‹قەل فڕی... فڕی تا ون بوو/ هەر رووڕەشی خۆی پێبڕا «هێمن»› ≡ نصیب شدن

**پێبژاردن** / pêb(i)jardin/: چاوگ. *[مەجاز]* تاوان لێ سەندن ≡ تاوان از کسی گرفتن

**پێبژیو** / pêb(i)jîw/: ناو. بژیو؛ مایەی ژین ≡ مایەی زندگی

**پێبک** / pêbik/: ناو. گلێنەی چاو ≡ مردُمک

**پێبلقە** / pêbilqe/: ☜ **پەیژە**

**پێبووکی** / pêbûkî/: ناو. باوەخۆن؛ کار و ڕەوتی پا کردنەوەی بووک بۆ ماڵی باوک ≡ اولین میهمانی عروس در منزل پدری

**پێبوون** / pêbûn/: چاوگ. ١. بە ڕۆژوو بوون ٢. لە لا بوون ٣. داگیرسان ≡ ١. روزەدار بودن ٢. همراه داشتن ٣. افروختە شدن

**پێبەپێی** / pêbepêy/: ئاوەڵکار. هاوڕێ؛ هافڕێ؛ هامڕا ≡ همگام

**پێبەتاڵ** / pêbetał/: ئاوەڵناو. ١. پێڵاوی لە ئەندازە بەدەر گەورە ٢. لاقی زۆر پان و زل ≡ ١. کفش بسیار بزرگ ٢. پای بسیار بزرگ

**پێبەدارە** / pêbedare/: ناو. پێدارە؛ سەری خڕی ئێسکی ڕان و باسک ≡ سرِ نیمدایرەی استخوان ران و بازو

**پێبەر**[1] / pêber/: ناو. بیبار؛ فلفلی گیا ≡ فلفل فرنگی

**پێبەر**[2]: ئاوەڵناو. داگیرکەر ≡ مُتجاوز

**پێبەروانە** / pêberwane/: ناو. کێشکچی؛ زێرەڤان ≡ نگهبان

**پێبەقنگە** / pêbeqinge/: ☜ **سۆنەبناقك**

**پێبەقوونە** / pêbeqûne/: ☜ **سۆنەبناقك**

**پێبەند / pêbend/:** ☜ **پابەند**[2]

**پێبەودم / pêbewidm/:** ئاوەڵناو. خۆش‌قەدەم؛ پێوقەدەم ممبارەک ▤ خوش‌قدم

**پێپاکی / pêpakî/:** ☜ **پاکانە ـ١**

**پێپان / pêpan/:** ئاوەڵناو. لنگ‌مەتک؛ پازل ▤ پهن پا

**پێپرژە / pêpirje/:** ناو. چینە؛ کاری خۆڵ بڵاو کردنی مریشک بە لاق ▤ چینە کردن مرغ

**پێپڕکە / pêpiřke/:** ناو. کاری سم لە زەوی گیر دانی حەیوانی تووڕە ▤ کار سُم بر زمین کشیدن حیوان خشمگین

**پێپشیلە / pêp(i)şîle/:** ناو. چنگەپشیلە؛ گیایەکە لە پەنجەی پشیلە ئەکا ▤ گیاهی است

**پێپلیک / pêp(i)lîk/:** ☜ **پلیکان ـ١**

**پێپلیکان / pêp(i)lîkan/:** ☜ **پلیکان ـ١**

**پێپلیکە / pêp(i)lîke/:** ☜ **پلیکان ـ١**

**پێپلینک / pêp(i)lînk/:** ☜ **پلیکان ـ١**

**پێپۆش / pêpoş/:** ☜ **پێتاو ـ١**

**پێپۆشین / pêpoşîn/:** ☜ **پۆشاندن**

**پێپەتی / pêpetî/:** ئاوەڵناو. پاپەتی: ١. پێخاوس ‹سەپانێکی هەژاری پێپەتی و شڕ/ کە خاوەن غیرەتە وەک شێری مەیدان «قانع»› ٢. *[پەلار]* بەرەڵڵا؛ گردە و گودە ▤ ١. پابرهنه ٢. آسمان‌جُل

**پێپەست / pêpest/:** ئاوەڵناو. پێخوست؛ پامال؛ پێشێل؛ پاشێل ‹چەن ساڵ گوڵی هیوای ئێمە پێپەست بوو تاکوو پار/ هەر خوێنی لاوەکان بوو گوڵی ئاڵی نەوبەهار «پیرەمێرد»›. هەروەها: **پێپەست بوون؛ پێپەست کردن** ▤ پایمال

**پێپەیژە / pêpeyje/:** ☜ **پەیژە**

**پێپیرۆز / pêpîroz/:** ئاوەڵناو. *[مەجاز]* قەدەم‌خێر ‹خدری پێپیرۆز لە کوێیە بۆچی لێڵە ئاوی ژین؟/ خوێن لە پەلکی گوڵ دەچۆڕێ، بای بەهاران چوونە کوێ؟ «حەقیقی»› ▤ فرخ‌پی؛ مُبارک‌قدم

**پێپیرۆزانە / pêpîrozane/:** ناو. *[فەرهەنگی خەڵکی]* دیارییەک کە بە بۆنەی لە دایک بوونی کەسێکەوە دەدرێت ‹پێپیرۆزانەی کەس بۆ ناهێنێ/ هیچ کەس بە چاکە هەرگیز نایدوێنێ «قانع»› ▤ نوعی قدم مبارکی نوزاد

**پێپیلکە / pêpîlke/:** ☜ **پلیکان ـ١**

**پێ . پێ / pê pê/:** ئاوەڵکار. وردە ـ وردە؛ هێدی ـ هێدی؛ جار لە دووی جار ▤ آرام ـ آرام؛ به تدریج

**پێت[1] / pêt/:** ناو. بڵێسە؛ گڕپە؛ گڕی ئاگر ‹برووسکا باتنێ دا دل د پێتێ سینە وێ وەر بوو/ کوو دێ بێتن تەبیتا دل د ناف وێ نار و پێتێدا «مەلای جزیری»› ▤ زبانەی آتش

**پێت[2]:** پێرۆ. ← **هێت‌وپێت**

**پێتاتە / pêtate/:** ناو. پێتەتە؛ تەختەی ژێر پای جۆلا ▤ پای‌افزار بافنده

**پێتاک / pêtak/:** ناو. پوورەهەنگ ▤ انبوه زنبور عسل

**پێتاو / pêtaw/:** ناو. ١. پێپۆش؛ پاتاوە؛ کاڵەوزەنگاڵ ‹جووتێ کلاشی قایم لە پەڕۆ/ کاڵە و پێتاوی هەتاکوو ئەژنۆ «موفتی پێنجوێنی»› ٢. میراوی برینج ▤ ١. پاتابه ٢. آبیار برنج

**پێتاوە / pêtawe/:** ☜ **پاتاوە ـ٢**

**پێتخەت / pêtxet/:** ☜ **پێتەخت**

**پێتک / pêtik/:** ☜ **پێتەک**[1]

**پێتن / pêtin/:** چاوگ. پێژان؛ نان کردن ▤ نان پُختن

**پێتوکە / pêtûke/:** ناو. گیایەکە دەکرێتە گزرە ▤ گیاهی که علف دام کنند

**پێتوون / pêtûn/:** ناو. کالیسکە؛ فایتوون ▤ کالسکه

**پێتەتە / pêtete/:** ☜ **پێتاتە**

**پێتەخت / pêtext/:** ناو. پاتەخت؛ پایتەخت؛ پێتخەت؛ شاری شانشین ▤ پایتخت

**پێتەزک / pêtezik/**: ناو. بەفرەچاڵ؛ کونە بەفر ☰ برفچال طبیعی

**پێتەک**[1] **/ pêtek/**: ناو. پێتک؛ باوانی؛ جیازی بووک کە ئەیباتە ماڵی زاوا ☰ جهیزیه

**پێتەک**[2]: ئاوەڵکار. کەمووسکەیەک ☰ کمی؛ اندکی

**پێچ**[1] **/ pêç/**: ناو. فیچ: ١. بورغی؛ جەڕ؛ هەواڵی مۆرە؛ میلەیەکی لوول و گرنجدار بۆ بەستن، ڕاگرتن، یان ڕێکوپێک کردنی دوو یا چەند تیکە پێکەوە ‹پێچی ماشین› ٢. قەمچ؛ با؛ چام؛ خولی ڕێگا؛ چەرخی جادە ‹جۆگەی ئاوەکان تیایا قەتیس ماو/ هەر ئەڕۆن ناکەن پێچی شاخ تەواو «گۆران»› ٣. خول؛ سوور؛ لەف ‹قەمچ و پێچ› ٤. *[مەجاز]* فرۆفێڵ ‹ئەم کارە پێچێکی ها تیا!› ٥. سەرپێچ؛ سەروێن؛ مێزەر ‹لە دوورەوە چ نمایانە پێچ و سەرپێچت!/ چ زوو ئەگاتە دەماخم شەپۆلی بۆی خۆشت! «گۆران»› ☰ ١. پیچ، همنشین مُهره ٢. پیچ جاده ٣. پیچ و خَم ۴. مکر و حیله ۵. دستار

⊡ **پێچ پیاهاتن**: ژان کردنی زگ لەپڕ و نەکاو ☰ به درد آمدن ناگهانی شکم

**پێچ خواردن**: باو خواردن ‹شەتاوان وەک مار لە دەشت پێچ ئەخۆن/ وەک سەوداکاران شێت و سەرەڕۆن! «پیرەمێرد»› ☰ پیچ خوردن

**پێچ خواردنەوە**: ١. گەڕانەوە؛ گەڕیانەوە؛ هەڵەوگەڕیان ٢. پێچ کردنەوە؛ لە ڕێگەیەک لادان بۆ لایەکی‌تر ☰ ١. برگشتن ٢. عوض کردن مسیر

**پێچ دان**: ١. بادان ٢. لوول دان ٣. سوور خواردن لە سەمادا ☰ ١. تاب داندن ٢. لوله کردن ٣. چرخیدن

**پێچ دانەوە**: گەڕانەوە؛ وەسووڕان ☰ بازگشتن

**پێچ کردن**: ١. بە پێچ قایم کردن ٢. ☜ **پێچ کردنەوە** ☰ ١. پیچاندن ٢. ☜ **پێچ کردنەوە**

**پێچ کردنەوە**: پێچ کردن: ١. با دانەوە لە ڕێگە ‹تا چاوی پێم کەوت، پێچی کردەوە و خۆی گوم کردا› ٢. *[کینایە]* بە دزییەوە کشانەوە؛ دووی بۆرە گرێ دان ☰ ١. عوض کردن مسیر ٢. جیم شدن

**پێچ لێدان**: ١. بە پێچ قایم کردن ٢. *[مەجاز]* فریودان؛ دەس برین ☰ ١. پیچ زدن ٢. نارو زدن

**پێچ و کڵاو تێکەڵ بوون**: *[مەجاز]* تێک‌هەڵچوون ☰ دست به یقه شدن

**پێچ**[2]: ئاوەڵناو. ١. باوخواردوو ٢. *[مەجاز]* لار؛ فێڵباز ‹کابرا فرە پێچە، باوڕی پێ ناکەم› ☰ ١. پیچ و خم خورده ٢. مکّار

• **پێچ**[3]: پاشەوشە. ١. ـ پێچدەر ‹بارپێچ؛ دەس‌پێچ› ٢. ـ پێچەوە ‹سەروێن‌پێچ؛ فیشەک‌پێچ› ٣. ـ پێچراو ‹کاغەزپێچ؛ دەسماڵ‌پێچ› ☰ ١تا٣. ـ پیچ

**پێچاران / pêçaran/**: چاوگ. بەڕێوە بردن؛ ئیدارە کردن ☰ اداره کردن

**پێچاڤک / pêçavik/**: ناو. کاڵانی چاو ☰ حدقه

**پێچاڵ / pêçał/**: ناو. قووڵکەی ژێر پای جۆلا ‹لە پێچاڵی دڵان تاری وتارت جوان گرێ داوە/ سەنا بۆ سانیعی شەی ساز کرد ئەو ڕایەڵ و پۆیە «حەقیقی»› ☰ پاچال بافنده

**پێچان / pêçan/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //پێچای؛ دەپێچێی؛ بپێچێ// ١. پێچران؛ پێچیان ٢. پێچاندن؛ پێچ دان؛ با دان؛ باو پێ دان ☰ ١. پیچ خوردن ٢. پیچ دادن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: پێچاو/ چاوگی نەرێنی: نەپێچان

**پێچاندن / pêçandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //پێچاندت؛ دەپێچێنی؛ بپێچێنە// پێچانن؛ پێچنای: ١. پێچان؛ باو پێدان ٢. توند شەتەک دان و بەستن ☰ ١. پیچ دادن ٢. محکم بستن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپێچاندن

**پێچاندنەوە / pêçand(i)newe/**: چاوگ. لوول

دان، وەک بۆ سفرە و کاغەز ☰ لولە کردن

**پێچانن / pêçanin/**: ☜ **پێچاندن**

**پێچانەوە / pêçanewe/**: چاوگ. تێپەڕ. //پێچاتەوە؛ دەپێچییەوە؛ بپێچەوە// ١. پێچاندنەوە ‹لاولاو کە بە شەو نەگەشێتەوە/ ڕۆژ ڕووی خۆی لە ڕۆژ ئەپێچێتەوە «پیرەمێرد»› ٢. جەم و ئامادە کردن ‹خۆت پێچەوە با بڕۆین!› ٣. [مەجاز] لێ پرسینەوە و بەسەرکردنەوە ☰ ١. لولە کردن ٢. شال و کلاه کردن ٣. احوال پرسیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەپێچانەوە

**پێچاو / pêçaw/**: ئاوەڵناو. پێچیاو؛ پێچیاگ؛ پێچدراو؛ باوخواردوو ☰ پیچیده

**پێچاوپێچ / pêçawpêç/**: ئاوەڵناو. پێچەلاوپێچ؛ پێچەلانپێچ؛ خوار و خێچ؛ باوداوی تێکەلاو ☰ پیچ‌درپیچ

**پێچبادەر / pêçbader/**: ☜ **پێچ‌گوشتی**

**پێچ . پێچ**[1] / pêç pêç/: ئاوەڵناو. ١. پڕ لە پێچ ٢. زۆر خوار و خێچ ☰ ١. پرپیچ و خم ٢. کج و کوله

**پێچ . پێچ**[2]: ئاوەڵکار. بە پێچاوپێچ ‹دووکەڵ لە لووتی وەک قەفی ڕەشمار/ پێچ ـ پێچ دێتە دەر لە سەر تا بە خوار «قانع»› ☰ پیچ‌درپیچ

**پێچ‌پێچۆکە / pêçpêçoke/**: ئاوەڵناو. پێچ‌پێچووکە: ١. پێچەڵپێچ؛ پێچاوپێچ ‹ئەو پێچ‌پێچۆکەی ڕێگەی خەراجیان/ ڕێچکەی فیلێکە بۆ ڕێوی دەوران «پیرەمێرد»› ٢. قیت و بەپێچ ☰ ١. پیچ‌درپیچ ٢. حلزونی

**پێچ‌پێچووکە / pêçpêçûke/**: ☜ **پێچ‌پێچۆکە**

**پێچ‌خواردوو / pêçx(i)wardû/**: ئاوەڵناو. بادراو؛ گەڕ ـ گەڕ؛ پێچدراو ☰ تاب‌خورده

**پێچ‌خۆر / pêçxor/**: ☜ **پێچەر**[2]ـ٢

**پێچدار / pêçdar/**: ☜ **بەپێچ**

**پێچدراو / pêçd(i)raw/**: ئاوەڵناو. بادراو؛ لوول‌دراو ☰ پیچ‌خورده

**پێچدەر / pêçder/**: ☜ **پێچەر**[2]ـ١

**پێچرا / pêç(i)ra/**: ناو. ١. ئامرازی لە دار یان گلێنە کە چرایان لە سەر دادەنا ٢. پاچرا؛ ئەو پارەیە لە قوماردا دەدرێ بە خاوەن قومارخانە ☰ ١. پاچراغ ٢. پولی که طرفین قمار به قمارخانه‌دار می‌پردازند

**پێچران / pêçran/**: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //پێچرای؛ دەپێچرێ؛ بپێچرێ// پێچان ☰ پیچ خوردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: پێچراو/ چاوگی نەرێنی: نەپێچران

**پێچرانەوە / pêçranewe/**: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //پێچرایەوە؛ دەپێچرێیەوە؛ بپێچرێوە// ١. لوول‌دران لە ناو شتێکدا ٢. هەڵگێران؛ لابران ☰ ١. لوله شدن ٢. برچیده شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: پێچراوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەپێچرانەوە

**پێچراو / pêçraw/**: ئاوەڵناو. ١. باخواردوو ٢. لوول‌دراو ☰ ١. تابیده ٢. حلقه شده

**پێچراوە / pêçrawe/**: ئاوەڵناو. ١. لوول‌دراو لە ناو شتێکا ٢. هەڵگێراو؛ لابراو ☰ ١. نوردیده در چیزی ٢. برچیده شده

**پێچر / pêçir/**: ئاوەڵناو. گیان‌سەخت ☰ جان‌سخت

**پێچک / pêçik/**: ناو. ١. گلۆلە بەنی خاوی هێشتا با نەدراو ٢. چەرخە عارەبە ٣. پاچەی ئاژەڵ ٤. پایەکورسی ☰ ١. خامه‌ی تاب نداده ٢. چرخ؛ ارابه ٣. پاچه‌ی حیوان ٤. پایه‌ی کرسی

**پێچ‌کوشتی / pêçkuştî/**: ناو. ☜ **پێچ‌گوشتی**

**پێچکە / pêçke/**: ناو. ١. منالی چکۆلە ٢. ئامرازێکی ئاسیاو ٣. چەرخی گاری و عەرابە ٤. پایەی کورسی ‹پێچکە چوارە بە ژمارە «مەسەل»› ٥. سەرپۆشی تۆڕی ‹پێچکەی پشتە سەر لە سەر زوڵفی ڕەش/ با بجریوێنێ وەک ئەستێرەی گەش «گۆران»› ☰ ١. نوزاد ٢. ابزاری در آسیا ٣. چرخ ارابه

۴. پایەی کرسی ۵. روسری توری

**پێچکەژلۆقە** / pêçkej(i)loqe/: ناو. گیایەکی کوێستانییە 🇮🇷 گیاهی است

**پێچکەسوێرە** / pêçkes(i)wêre/: ناو. گیایەکی کوێستانییە وەک پیوازە و دەخورێ 🇮🇷 گیاهی است

**پێچگوشتی** / pêçguştî/: ناو. پێچگوشتی؛ پێچکوشتی؛ پێچەر؛ پێچبادەر؛ پێچوادەر؛ بادەر؛ جەڕبادەر؛ ئامرازی پێچ دان 🇮🇷 پیچ‌گوشتی

**پێچگوشی** / pêçgûşî/: ☜ **پێچگوشتی**

**پێچن** / pêçin/: ☜ **پێچە ـ۲**

**پێچنای** / pêçnay/: ☜ **پێچاندن**

**پێچوادەر** / pêçwader/: ☜ **پێچگوشتی**

**پێچوپا** / pêç û pa/: ناو. ناڕاستی؛ گزوفز ‹خوا تۆبە لە پێچوپا!› 🇮🇷 ناراستی

**پێچوپلۆچ**[1] / pêç û p(i)łoç/: ناو. حیلە و حەوالە ‹ئەو هەموو پێچوپلۆچە بە کوێ دەگا؟!› 🇮🇷 مکر؛ فریب

**پێچوپلۆچ**[2]: ئاوەڵناو. ۱. خوار و خێچ ‹لەم خەتە پێچوپلۆچە سەر دەر ناکەم› ۲. ئاڵۆز؛ تێکەڵ ـ پێکەڵ ‹چەند لاپەڕەی پێچوپلۆچی نووسیوە، ناوی ناوە گوتار!› 🇮🇷 ۱. کج و کوله ۲. درهم ـ برهم

**پێچوپەنا**[1] / pêç û pena/: ناو. جێگەی وەشاردنەوەی شتێ 🇮🇷 جای پنهان کردن چیزی

**پێچوپەنا**[2]: ئاوەڵناو. بە ئاماژە و لێڵی (بۆ قسە) ‹قسەی پێچوپەنا بەسە، چت لە دڵدایە بە ڕاشکاوی دەریخە!› 🇮🇷 در لفافه

**پێچوپەنا**[3]: ئاوەڵکار. زۆر بە ئاماژە و گۆمی ‹فرە پێچوپەنا قسە دەکا› 🇮🇷 در لفافه

**پێچوقەمچ** / pêç û qemç/: ناو. پێچی لە سەر یەک 🇮🇷 پیچواپیچ

**پێچ و کڵاو** / pêç û k(i)ław/: ناو. مێزەر؛ مێزەرە 🇮🇷 دستار

**پێچ و مۆرە** / pêç û more/: ناو. بورغی و بنەکە 🇮🇷 پیچ و مهره

**پێچومێزەر** / pêç û mêzer/: ناو. سەروپێچ؛ مێزەر 🇮🇷 دستار

**پێچوێلەکە** / pêç(i)wêleke/: ناو. پاکۆترە؛ پێمریشکە؛ گیایەکە دەخورێ 🇮🇷 گیاهی خوردنی

**پێچۆک** / pêçok/: ناو. ڕەوڕەوەی پێ‌گرتنی منداڵ 🇮🇷 رَورَوک کودک

**پێچۆلەکە** / pêçoleke/: ناو. پامەلووچک؛ پێچووک؛ گیایەکە وەک چنگی چێشکە دەچێ 🇮🇷 گیاهی است

**پێچۆڵ** / pêçoł/: ناو. ڕان؛ مێگەل 🇮🇷 گله

**پێچووک** / pêçûk/: ☜ **پێچۆلەکە**

**پێچووکە** / pêçûke/: ناو. بسکی سەر تەوێڵ 🇮🇷 زلف روی پیشانی

**پێچوون** / pêçûn/: چاوگ. ۱. کات بردن؛ خایاندن ‹سواری کەشتی بووین، نازانم چەند شەومان پێ چوو. بەربەیانێک بە ئەستەمبووڵدا تێپەڕین بەرەو لوبنان «هەژار، چێشتی مجێور»› ۲. خەجاڵەت کێشان ‹خەمت نەبێ، بە جنێوان پێ‌ناچێ! وەکوو خەڵاتی بکەی، وایە!› ۳. کار تێکردن ‹بەو کارە نالەبارە کوڕەکەی کردبووی، زۆر پێ‌چوو› ٤. لاواز بوون؛ کز بوون ‹کە لە بەند بەر بوو، زۆر پێ‌چووبوو› 🇮🇷 ۱. زمان بردن ۲. خجالت کشیدن ۳. متأثر شدن ۴. تکیده شدن

**پێچە** / pêçe/: ناو. ۱. پەچە؛ ڕووبەندە ۲. نەرمیلێ؛ پێچن؛ پێچی؛ گیایەکی ئالیکی پایا بە بۆنێکی تیژ و ناخۆش، گەڵای ئەستوور و گۆشتنەوە کە بۆ دەرمان دەشێ 🇮🇷 ۱. روبنده ۲. سداب

**پێچەر**[1] / pêçer/: ☜ **پێچگوشتی**

**پێچەر**[2]: ئاوەڵناو. ۱. پێچدەر؛ بادەر ۲. پێچخۆر 🇮🇷 ۱. پیچنده ۲. پیچ‌خورنده

**پێ‌چەقێن** / pêçeqên/: ئاوەڵناو. سمنج؛ سەرەخەر؛ گەگر ≡ سِمِج

**پێ‌چەقێنی** / pêçeqênî/: ناو. سەرەخەری؛ گەگری ≡ لجبازی

**پێچەک** / pêçek/: ناو. داری دووفلیقانە کە نچیری پێ لە کونی دەردێنن، تووکی بەر دەکەوێ، بای دەدەن و دەیکێشن ≡ چوب دوشاخه‌ای که شکار را با آن از سوراخ بیرون کشند

**پێچەکولو** / pêçekulû/: ناو. کلووی لۆکەی خاو ≡ آغنده

**پێچەڵانپێچ** / pêçełanpêç/: ☜ **پێچەڵپێچ**

**پێچەڵاوپێچ** / pêçeławpêç/: ☜ **پێچەڵپێچ**

**پێچەڵپاچ** / pêçełpaç/: ☜ **پێچەڵپێچ**

**پێچەڵپێچ**[1] / pêçełpêç/: ئاوەڵناو. پێچەڵانپێچ؛ پێچەڵاوپێچ؛ پێچەڵپاچ: ١. لار؛ خوار و خێچ ٢. پێچاوپێچ؛ پێچەڵۆک؛ قیل‌قاج؛ خوارەوخوار؛ پڕ لە پێچ ٣. دژوار؛ سەخت ‹ئەم ڕووداوە زۆر پێچەڵپێچە و لێکدانەوەی زۆری دەوێ› ≡ ١. کج‌وکوله ٢. پرپیچ و خم ٣. پیچیده

**پێچەڵپێچ**[2]: ئاوەڵکار. لارەولار؛ پێچەڵانپێچ؛ پێچەڵاوپێچ؛ پێچەڵپاچ ‹پێچەڵپێچ بڕیمان› ≡ اُریب

**پێچەڵۆک** / pêçełok/: ئاوەڵناو. پێچەڵپێچ ≡ پرپیچ و خم

**پێچەن** / pêçen/: ناو. ١. تا باری لوول‌دراوی ڕەشماڵ ٢. داری ناو تا بار کە لە سەری لوول دەدەن ٣. داری گوریسی بار توند کردن ≡ ١. لنگه بار چادر ٢. چوبی که چادر را به دورش پیچند ٣. چوبی که بار را بدان محکم کنند

**پێچەنە** / pêçene/: ناو. دەس‌پێچەنە؛ دەسرازە ≡ قُنداق‌پیچ گهواره

**پێچەوانە**[1] / pêçewane/: ئاوەڵناو. ١. دژ؛ بەرچەپ ‹ئاکاری لە کاری باش نەبانە/ سەرگەرمە بە کاری پێچەوانە «هەژار، مەم و زین»› ٢. بەراوەژوو؛ بەروپشت؛ پشت‌وڕوو؛ بە باری پێچەوانەدا ≡ ١. مخالف ٢. وارونه

**پێچەوانە**[2]: ئاوەڵکار. چەپەوانە؛ سەرەوخوار؛ بە شێوەی سەروبن ‹ژێرکراسەکەی پێچەوانە کردگەسە بەری!› ≡ وارونه

**پێچەوانەی** / pêçewaney/: ئامراز. بەرچەپ ≡ برخلافِ

• **پێچەوە** / pêçewe-/: پاشەوشە. وەپێچ ‹بارپێچەوە› ≡ - پیچ

**پێچی**[1] / pêçî/: ناو. ١. پەنجە؛ ناولەپ ٢. ☜ پێچە-٢ ≡ ١. پنجه ٢. ☜ **پێچە -٢**

• **پێچی**[2]: پاشەوشە. ڕەوتی پێچانەوە ‹بارپێچی› ≡ - پیچی

**پێچیاگ** / pêçyag/: ☜ **پێچاو**

**پێچیان** / pêçyan/: چاوگ. پێچیای: ١. پێچان؛ باوخواردن ٢. سووڕ خواردن لە ڕەقسدا ≡ ١. پیچیدن ٢. چرخیدن در رقص

**پێچیاو** / pêçyaw/: ☜ **پێچاو**

**پێچیای** / pêçyay/: ☜ **پێچیان**

**پێچیلە** / pêçîle/: ناو. موورگەگیا؛ مووروەگیا ≡ گل لادن

**پێ‌حاجیلە** / pêĥacîle/: ناو. تۆلک؛ پەنیرۆک؛ پەپەچەورە ≡ پنیرک

**پێ‌حەسان** / pêĥesan/: چاوگ. هەست پێ کردن ≡ احساس کردن

**پێخ** / pêx/: ناو. ڕیپۆقی چاو ≡ ژَفَک؛ قی چشم

**پێخام** / pêxam/: ☜ **پەیام**

**پێخاوس**[1] / pêxawis/: ئاوەڵناو. پێرووت؛ بێ‌پێڵاو ‹منداڵەکانی پێخاوسن› ≡ پابرهنه

**پێخاوس**[2]: ئاوەڵکار. پێرووت؛ بێ‌پێڵاو ‹پێخاوس کەوتینە ڕێ› ≡ پابرهنه

**پێ‌خشکە** / pêxişke/: ئاوەڵکار. بزدم؛ پاچڕکێ؛

پێدزە 🇮🇷 پاورچین

**پێخـواس** / pêx(i)was/: ئاوەڵـناو. پێخـــاوس 🇮🇷 پابرهنه

**پێخواسی** / pêx(i)wasî/: ناو. خواسی؛ بـێ‌پـێڵاوی 🇮🇷 پابرهنگی

**پێ‌خورین** / pêxurîn/: چاوگ. پێ‌نازین؛ پشت بـە کەسێ بەستن 🇮🇷 نازیدن (به کسی)

**پێخـوس** / pêxus/: ئاوەڵـناو. پاشـێل؛ پێخوسـت؛ بەرپێ‌دراو؛ پێ‌ڕێ‌خراو. هەروەها: **پێخـوس بـوون؛ پێخوس کردن** 🇮🇷 پایمال

**پێخوست** / pêxust/: ☜ **پێخوس**

**پێخولـە** / pêxule/: ئاوەڵـناو. نۆپێچکـە؛ پێرەوکـە؛ تازە پا گرتوو 🇮🇷 نوپا

**پێخوەر** / pêx(i)wer/: ☜ **پێخۆر**

**پێخوێ** / pêx(i)wê/: ناو. ١. ئەنـدازەی قـوڕێکی سواغ ٢. پاخوا؛ کلۆشـی بـەر پـای گـاگێرە 🇮🇷 ١. مقدار کاهگل آماده برای یک بار اندودن ٢. خرمن در حال کوبیده شدن

**پێخۆر** / pêxor/: ناو. پێخوەر: ١. هەرچی بە نانەوە ئەیخۆن ‹ترێ پادشای هەموو میوانە/ هاوین پێخۆری هەموو میوانە «پیرەمێرد»› ٢. *[مەجاز]* کـار و ڕەوتی دەس پێوە گرتن 🇮🇷 ١. نانخورش ٢. صرفه‌جویی

⊡ **پێخۆر پێوە کردن**: بـە نـانی زۆرتـر و خـۆراکی کەمتر خۆ تێر کردن 🇮🇷 نان بیشـتر و نـانخورش کمتر مصرف کردن

**پێخەسو** / pêxesû/: نـاو. پاخەسـوو؛ پاخەسـوور؛ پـاوەوی؛ پـاوەیوە؛ پۆرسـپی؛ بـەربووک؛ بەربوودی؛ بەربووری؛ بەربودی؛ بەربیک؛ بـەربوو؛ بوکنی؛ بانبارگە؛ بزگێلـە؛ سەرسـپی؛ سـەرجازی؛ ژنێ کە دەگەڵ بووکدا دەچـێ بـۆ ماڵـی زاوا تـا بووک بۆ چوونە پـەردە ڕێنـوێنی بکـا و هەواڵـی داوێن‌پاکیشی بێنێتەوە بۆ بـاوان ‹خـوا مـرادم بـا، باخم بەر بێنێ/ بۆ خـۆم پێخەسـوو، کـوڕم ژن بێنـێ «فولکلۆر»› 🇮🇷 ینگه

**پێخەسولە** / pêxesûle/: نـاو. دەسکەگیایەک کـە بـۆ قـایم کـردنی گرێـی شـەغرە کەڵـکی لـێ وەردەگیرێ و دەدرێتە بەر قولفەی گرێکە، شـل نەبێتەوە 🇮🇷 یک دسته گیاه که زیر گره بار می‌گذارند، شُل نشود

**پێخەف** / pêxef/: نـاو. ١. سـەرناز؛ نقـین؛ نـوێن؛ دەستەنوێن؛ سەرەخەر؛ جێگەوبان؛ جاگە؛ جێوان؛ جـلوجێـوان؛ جـلجێـوان؛ جێوبـات؛ یاگۆبـان؛ بەستەک؛ متێل؛ ڕەختخاو؛ یەتاخ؛ یاتـاخ؛ پـرتال؛ پڕتان؛ سەرجەمی ئەو کەرەسانە کە بـۆ خـەوتنی ڕادەخەن (وەک: دۆشەک، لێفە؛ پەتوو، سەرین و...) ‹پێخەفـــی کـــەران، خۆڵـــەکەوەیە «مەســـەل»› ٢. سەرپۆشی خەوتوو 🇮🇷 ١. رختخواب ٢. روانداز

**پێخەم**[1] / pêxem/: ناو. ١. ☜ **پـەیام** ٢. پـەیامی ئاسمانی 🇮🇷 ١. ☜ **پەیام** ٢. وحی

**پێخەم**[2]: ئاوەڵناو. پابەنـد؛ دەربـەن؛ دەربەسـت 🇮🇷 مُقید

**پێخەمبەر** / pêxember/: ☜ **پەیامبەر ـ١**

**پێخەنین** / pêxenîn/: چاوگ. پێکـەنین؛ خـەنین؛ کەنین 🇮🇷 خندیدن

**پێدا**[1] / pêda/: ئامراز. پێیدا؛ بە ئەو دا ‹مەوج مـەدۆ زوهوور نوور حەق تێدا/ هەر ڕەگ مەشعەڵێ مەویەرۆ پێدا «مەولەوی»› 🇮🇷 بر او

**پێدا ـ**[2]: پێشگر. بە شتێ، کەسێ یـان دیاردەیەکـدا 🇮🇷 به/ بر چیزی، کسی یا پدیده‌ای

| | | |
|---|---|---|
| پێدابران | پێدابردن | پێداچزان |
| پێداچوون | پێداچەقان | پێدادان |
| پێدادروون | پێداراگەیاندن | پێداساوین |
| پێداکران | پێداکردن | پێداکێشان |
| پێداگرتن | پێداگەیاندن | پێداگیران |
| پێدالەقاندن | پێدامالین | پێدانان |
| پێدانووسان | پێدانووساندن | پێداهاتن |

پێداهاتنەوە پێداهەڵپژان پێداهەڵپەساردن
پێداهەڵچەقین پێداهەڵخستن پێداهەڵخوشان
پێداهەڵخوێندن پێداهەڵدان پێداهەڵشاخان
پێداهەڵکالان پێداهەڵکردن پێداهەڵگوتن
پێداهەڵگەڕان پێداهەڵمیزتن پێداهەڵنان
پێداهەڵنیشتن پێداهەڵواسین پێداهێنان

**پێدابردن** / pêdabirdin/: چاوگ. پێبابردن: ١. تێنان؛ تێهەڵچەقان؛ دە ناو نان ٢. بە ڕێگایەکدا بردن ☰ ١. در چیزی فرو بردن ٢. از مسیری عبور دادن

**پێدا ، پێدا** / pêda pêda/: ئاوەڵکار. پەیتا-پەیتا ☰ پی‌درپی

**پێداچزان** / pêdaç(i)zan/: چاوگ. پیاچزان؛ گەرم و داغ وە لەش یان شتێ کەوتن ☰ شیئ داغ بر بدن یا چیزی افتادن

**پێداچزاندن** / pêdaç(i)zandin/: چاوگ. پیاچزاندن؛ پیاچزانن؛ پێداچزانن؛ داغ بە لەش یان شتێکەوە نان ☰ شیئ داغ بر بدن یا چیزی نهادن

**پێداچزانن** / pêdaç(i)zanin/: ☜ **پێداچزاندن**

**پێداچوون** / pêdaçûn/: چاوگ. پیاچوون: ١. بە شوێنێکدا ڕۆیشتن ٢. *[مەجاز]* لە سەر قسە ڕۆیشتن ٣. تێوەچوون؛ بە شتێکدا چوون ☰ ١. از جایی عبور کردن ٢. کش دادن ٣. در چیزی فرو رفتن

**پێداچوونەوە** / pêdaçûnewe/: چاوگ. پیاچوونەوە: ١. گەڕانەوە بە شوێنێکا ٢. *[مەجاز]* چاو پێداخشاندن؛ تەماشا کردنەوەی سەرلەبەری نووسراوەیەک و ورد بوونەوە لە سەر باسە گرینگەکانی ٣. *[مەجاز]* لە سەر قسە ڕۆیشتن ☰ ١. دوباره گذر کردن از جایی ٢. بازخواندن ٣. سخن را کش دادن

**پێداچەقان** / pêdaçeqan/: چاوگ. تێهەڵچوون؛ تێهەڵچەقان ☰ خلیدن

**پێداچەقاندن** / pêdaçeqandin/: چاوگ. پیاچەقاندن؛ تێ‌ڕۆ کردن؛ تێ‌بردن؛ دەناورۆ کردن؛ بردنە ناو ☰ فرو کردن

**پێداخستن** / pêdaxistin/: چاوگ. بە سەردا دان؛ داپۆشین ☰ بر روی چیزی/ کسی انداختن؛ پوشاندن

**پێداخشاندن** / pêdax(i)şandin/: ڕێ خشاندن ☰ ساییدن بر چیزی

**پێدادان** / pêdadan/: چاوگ. پیادان: ١. بە سەر هەڵکێشانی لێفە و پێخەف ٢. داپۆشین ٣. لە سەر و گوێلاک دان ٤. هێرش کردن ٥. تێوەردان؛ ئاو یان تراوی تر دە دەفر گەڕاندن بۆ خاوێنی ☰ ١. بر سر کشیدن ٢. پوشاندن ٣. توسری زدن ۴. هجوم بردن ۵. آب یا مایعی را در ظرف گرداندن

**پێدادروون** / pêdad(i)rûn/: چاوگ. پیادوورین؛ بە سەردا دوورین ☰ بر چیزی دوختن

**پێدارە** / pêdare/: ناو. پێبەدارە؛ سەری خڕی ئێسکی ڕان و باسک ☰ سرِ گردِ استخوان ران و بازو

**پێداڕاگەیاندن** / pêdařageyandin/: چاوگ. پیاڕاگەیاندن؛ بە گوێدا دانی خەبەر و فەرمان ☰ خبر رساندن

**پێداڕوو** / pêdařû/: ناو. پنجی پینەی دێزە و گۆزە ☰ وصلەی ظروف گلی

**پێداساویاو** / pêdasawyaw/: ئاوەڵناو. ماڵراو؛ ماڵیاو؛ ماڵێوراو ☰ ساییده شده بر

**پێداساوین** / pêdasawîn/: چاوگ. پیاساوین؛ ڕێخستن؛ سوونەوەی شتێک بە شتێکدا ☰ بر روی چیزی ساییدن

**پێداڤ** / pêdav/: ناو. تەڵە؛ داو ☰ دام

**پێداکردن** / pêdakirdin/: چاوگ. پیاکردن: ١. بە سەردا کردن ٢. تێنان؛ چەقاندن؛ دە ناو نان ٣. فڕ کردن ☰ ١. پاشیدن ٢. فرو بردن ٣. سرکشیدن

**پێداکێشان** / pêdakêşan/: چاوگ. پیاکێشان: ١.

لێدانی توند بە دار و ... ٢. بە زۆر دە ناو نــان ٣. بە سەردا دان 🇮🇷 ١. محکم زدن با چوب و ... ٢. بـە زور لای چیزی گذاشتن ٣. بر سر کشیدن

**پێ‌داگر** / pêdagir/: ئاوەڵناو. سوور 🇮🇷 مُصر

**پێـــداگرتن** / pêdagirtin/: چـــاوگ. پیـــاگرتن؛ داپۆشین 🇮🇷 روی چیزی را پوشیدن

**پێ‌داگـری** / pêdagirî/: نـاو. جـــەخت؛ کـــوت 🇮🇷 پافشاری

**پێداگـەڕان** / pêdageřan/: چـاوگ. ١. پشــکنین؛ پشکوین؛ پشکاندن ٢. هەر جارەی لە ئەندامێکدا دەرکەوتن (ژان) ‹لـە هەوەڵـی بـەهارەوە ئـەو ژانـە پێمدا دەگەڕێ› 🇮🇷 ١. کاویدن؛ تفتیش کردن ٢. هـر بار در یک اندام رخنه کردن (درد)

**پێداگەیانـــــدن** / pêdageyandin/: چـــــاوگ. پیاگەیاندن؛ دابەش کردنی وا کە هـەموو بـەریان بکەوێ 🇮🇷 به همه رساندن

**پێـداگێران** / pêdagîran/: چـاوگ. پیـاگێران؛ بـە دەورە داگێران 🇮🇷 اطراف چیزی پوشیده شدن

**پێداڵەقان** / pêdaleqan/: چاوگ. هەڵواسـین بـە شتێکەوە 🇮🇷 آویختن

**پێداڵەقانـــدن** / pêdaleqandin/: چـــــاوگ. هەڵاوەساندن بە شتێکا 🇮🇷 آویزان کردن

**پێـداماڵین** / pêdamałîn/: چـاوگ. پیاماڵـین: ١. پێداساوین ٢. لێ‌دان 🇮🇷 ١. بـر چیـزی سـاییدن ٢. زدن

**پــێ‌دان** / pêdan/: چـــاوگ. ١. دان؛ دایــــن ٢. بەخشین 🇮🇷 ١. دادن ٢. بخشیدن

**پێدانان** / pêdanan/: چاوگ. پیانان؛ لە سەر دانان 🇮🇷 نهادن

**پێدانووسـان** / pêdanûsan/: چـاوگ. پیانووسـان؛ پێوە لکان 🇮🇷 به چیزی چسبیدن

**پێدانووســـاندن** / pêdanûsandin/: چـــــاوگ. پیانووساندن؛ پێوە لکاندن 🇮🇷 به چیزی چسباندن

**پێداو**[١] / pêdaw/: ☜ **پاداو**

• **پێداو**[٢]: پاشەوشـە. ـ پێ بەخشیو ‹خواپێداو› 🇮🇷 بـه او داده شده

**پێداویست** / pêdawîst/: ئاوەڵـناو. پێویســـت؛ لازم ‹بۆ پێکهاتنی ئەم ئاواتەش شنگڵێکی پێداویست بـوو لە خۆ بدرێ و کارێک بکرێ هەژار بـە بێچـارەخـوران نەخورێ «هەژار، *بۆکوردستان*»› 🇮🇷 لازم

**پێداویستی** / pêdawîstî/: ناو. پێدڤـی؛ پێدڤـیاتی؛ کەمایەسی؛ حەوجە؛ ئاتاجی؛ نیاز ‹نرخی شتی زۆر پێداویستی ژیان، وەک نان و پێخـۆرێ کـە لـە مـاڵ دروست بکـرێ، هـەرزان و شـتی زۆر ناپێداویسـت و دەوڵەمەندانە، لەو پەڕی گرانیدا بوو «هەژار، چێشـتی مجێور»› 🇮🇷 نیاز

**پێداهاتن** / pêdahatin/: چاوگ. پیاهـاتن: ١. بـە شتێکدا بوورین ٢. بە لەشدا بوورین ٣. بە تێـر و تەسەلی باس کردن ٤. زۆر پێوە خەریک بوون 🇮🇷 ١. بر روی چیزی گذشتن ٢. تیر کشیدن ٣. به تفصیل گفتن ٤. روی کاری وقت گذاشتن

**پێداهاتنـــــەوە** / pêdahat(i)newe/: چـــــاوگ. پیاهاتنەوە: ١. دیسـان چـوون بـە شـوێنێکدا ٢. جارێکی تر سەرلەبەر دیتنەوە و بە وردی ڕوانـین 🇮🇷 ١. دوباره گذشتن از جایی ٢. بازنگری کردن

**پێداهانین** / pêdahanîn/: ☜ **پێداهێنان**

**پێداهـــــەڵپژان** / pêdahełp(i)jan/: چـــــاوگ. پیاهەڵپژان: ١. شتی تراو پێـدا پـژان ٢. *[مەجاز]* گەڕ تێ‌هاڵان؛ شەڕ پێ فرۆشران 🇮🇷 ١. مـایعی بـر کسی/ چیزی پاشیده شدن ٢. گرفتار شدن

**پێداهەڵپژانـدن** / pêdahełp(i)jandin/: چـاوگ. پیاهەڵپژاندن: ١. ئاو یان شتی شل بە کەسـێکدا کــردن ٢. *[مـەجاز]* شــەڕ پــێ‌فرۆشــتن؛ گــەڕ تێ‌هاڵاندن 🇮🇷 ١. مـایعی را بـر سـر کسـی/ چیـزی پاشیدن ٢. گرفتار کردن

**پێداهەڵپەسـاردن** / pêdahełpesardin/: چـاوگ.

پیاهەڵپەساردن؛ پاڵ دانی شتێ بـە شـتێکەوە 🇮🇷 تکیە دادن چیزی بە چیز دیگر

**پێداهەڵچـــوون** / pêdahelçûn/: چـــــاوگ. پیاهەڵچوون؛ بە شتی دژواردا سەر کەوتن؛ بە دار و شاخی سەختا هەڵـچوون 🇮🇷 از درخـت/ صـخره بالا رفتن

**پێداهەڵچـــەقان** / pêdahelçeqan/: چـــاوگ. پیاهەڵچەقین؛ پێداهەڵچەقین؛ تێـرۆچوون؛ دڕوو یا تەلاش یان بزمار تێچەقین 🇮🇷 در چیزی خلیدن

**پێداهەڵچـــــــەقین** / pêdahelçeqîn/: ☜ **پێداهەڵچەقان**

**پێداهەڵخوشـــان** / pêdahelxuşan/: چـــاوگ. پیاهەڵخوشین؛ پێداهەڵخوشین؛ پێداهەڵشاخین؛ بەربینگ پێ‌گرتن و کێشە تێ‌هالاندن 🇮🇷 گریـان کسی را گرفتن و با او ستیزە کردن

**پێداهەڵخوشـــــــین** / pêdahelxuşîn/: ☜ **پێداهەڵخوشان**

**پێداهەڵخوێنـدن** / pêdahelx(i)wêndin/: چـاوگ. پیاهەڵخوێندن؛ پشـتەملە گـوتن؛ خـراپ گـوتن دەربارەی کەسێ 🇮🇷 غیبت کردن

**پێداهەڵدان** / pêdaheldan/: چـاوگ. پیاهەڵـدان؛ پێ هەڵگوتن؛ بە بالادا گوتن؛ تـاریف کـردن ‹لـە پاشەملە خراپەی دەڵێ و لە ڕووبەڕوو پێدا هەڵدەدا!› 🇮🇷 تعریف و تمجید کردن

**پێداهــەڵڕوانین** / pêdaheř(i)wanîn/: چــاوگ. تێ‌هەڵڕوانین؛ لە خـوارەوە بـۆ سـەرەوە تماشـای شتێ کردن ‹لە کونی دەرگاوە، پێیدا هەڵـدەڕوانن› 🇮🇷 چیزی را از پایین نگاه کردن

**پێداهەڵشـــاخان** / pêdahelşaxan/: چـــاوگ. پیاهەڵشاخان؛ پیاهەڵشـاخین؛ پێداهەڵشـاخین؛ ڕووبەڕوو بە گژدا چوون ‹دایکم بـە دیڵـکی پـڕەوە، پێمدا هەڵشاخی› 🇮🇷 رودررو بە کسی دشنام دادن

**پێداهەڵشـــــــاخین** / pêdahelşaxîn/: ☜ **پێداهەڵشاخان**

**پێداهـــەڵکالان** / pêdahelkalan/: چـــاوگ. پیاهەڵکالان؛ پیاهەڵکالین؛ ئێرەیی بـە کەسـێ بردن و قسـەی پـێ کـردن 🇮🇷 حسـودانە غیبـت کردن

**پێداهـــەڵگوتن** / pêdahelgutin/: چـــاوگ. پیاهەڵگوتن 🇮🇷 تعریف و تمجید کردن

**پێداهەڵگـــەڕان** / pêdahelgeřan/: چـــاوگ. پیاهەڵگەڕان؛ پێ‌هەڵـگەڕان؛ بـەرەوژوورە چـوون ‹بە کێودا هەڵگەڕان› 🇮🇷 صعود کردن

**پێداهـــەڵمیزتن** / pêdahelmîztin/: چـــاوگ. پیاهەڵـمیزان؛ پیاهەڵـمیزتن؛ پیاهەڵـمیزین؛ پێ‌هەڵمیزتن؛ پێ‌هەڵمیزین؛ بە سـەردا میـزتن؛ لە بالاوە میـز بـە شـتێکدا کـردن 🇮🇷 بـر چیـزی شاشیدن

**پێداهەڵنان** / pêdahelnan/: چاوگ. پیاهەڵـنان؛ پیاهەڵپەساردن 🇮🇷 تکیە دادن بر چیزی

**پێداهەڵواســـین** / pêdahelwasîn/: چـــاوگ. پیاهەڵواسین؛ دالەقانـدن بـە شـتێکدا 🇮🇷 بـە/ بـر چیزی آویختن

**پێـداهێنان** / pêdahênan/: چـاوگ. پیاهـاوردن؛ پیاهانین؛ پیاهێنان؛ پێداهانین: ١. پێداساوین ٢. خستنی چادر بۆ بار کردن 🇮🇷 ١. بر چیزی ساییدن ٢. انداختن خیمە بە منظور عزیمت

**پێدرکانـــدن** / pêdirkandin/: چـــاوگ. قســـە دەرهێنان؛ قسە دەرکێشان 🇮🇷 حـرف از زیـر زبـان کشیدن

**پێدرێژی** / pêd(i)rêjî/: ناو. چۆنیەتی لە ئەندازەی خۆ دەرچوون 🇮🇷 حالت از حد خود تجاوز کردن

**پێدزکێ** / pêdizkê/: ☜ **پێدزە**

**پێدزە** / pêd(i)ze/: ئاوەڵکار. پێدزکێ؛ پێدزەکێ؛ پـێ‌خشـکە؛ خـۆ کشـاندنەوەی کـەم‌ـکـەم 🇮🇷 پاورچین

⊡ **پێدزه کردن:** دزه کردن؛ باریکەو بوون؛ فیزمالک دان ≡ جیم شدن

**پێدزەکێ / pêd(i)zekê/:** ☜ **پێدزه**

**پێدڤی / pêd(i)vî/:** ☜ **پێداویستی**

**پێدڤیاتی / pêdiv(i)yatî/:** ☜ **پێداویستی**

**پێدەشت / pêdeşt/:** ناو. دەشتایی بن چیا ‹گەلان ئاوا بوون گەیشتنە سەر کەل/ ئێمەش لە پێدەشت وەک حەیوانی شەل «موفتی پێنجوینی»› ≡ دامنەی کوە

**پێدەڤی / pêdevî/:** ئاوەڵناو. پێویست؛ پێداویست ≡ ضروری

**پێر[1] / pêr/:** ناو. پێری؛ پێڕێ؛ پێرەکە؛ دوو ڕۆژ پێش؛ ڕۆژی بەر لە دوێکە ≡ پریروز

**پێر[2]:** ئاوەڵکار. پێری؛ پێڕێ؛ پێرەکە؛ لە ڕۆژی بەر لە دوێکەدا ≡ پریروز

**پێرار[1] / pêrar/:** ناو. پێرارەکە؛ پێرارساڵ؛ دوو ساڵ پێش ‹هەموو ڕۆژێ لە تاو هیجرانی ئەمساڵ/ تەمەننای مردنی پێرارە بێ تۆ «نالی»› ≡ پیرارسال

**پێرار[2]:** ئاوەڵکار. پێرارەکە؛ پێرارساڵ؛ لە دوو ساڵ پێشدا ‹پێرار هاتمەوە› ≡ پیرارسال

**پێرارساڵ / pêrarsał/:** ☜ **پێرار**

**پێرارەکە / pêrareke/:** ☜ **پێرار**

**پێران / pêran/:** ناو. دووشاخە؛ قاس؛ بوغمە؛ بەغمە؛ وەناق؛ وناخ؛ نەخۆشییەکی گیرۆیە لە جۆرێ باسیل سەر هەڵدەدا و تۆژاڵێکی نووستەک لە سەر گەروو، قورقوڕانچک و برێ‌جار چاو و شەرمی ژن دروست دەکا ≡ خُناق

**پێرایی / pêrayî/:** ئامراز. غالبە؛ زۆرینەی؛ زۆربەی ≡ اکثریت

**پێرست / pêrist/:** ناو. پێڕست؛ پێرس؛ فیهرست؛ فێرست: ١. نووسراوەیێ بریتی لە زانیاری تایبەت لەمەڕ بەش و ئەندامانی کۆمەڵێکەوە ‹پێرستی ناو› ٢. نووسراوەیێ کە کتێب و بلاڤۆکی شوێن یان بابەتێکی تێدا هاتووە ‹پێرستی کتێبگەلی ژینناسی› ≡ ١و٢. فهرست

**پێرک / pêrik/:** ناو. گۆماوی خۆڕست لە چیادا ≡ درياچەی طبیعی در دل کوە

**پێرگین / pêrgîn/:** ناو. ملاقات؛ دیدار؛ دیمانە ≡ مُلاقات

**پێروو / pêrû/:** ناو. پیرۆ: ١. ئەستێرەی کۆ؛ پێور؛ پەروین؛ سوورەییا؛ ئەستێرە شەشانەکەی ئاسمان ‹گەلاوێژی هەلاتووی/ پێرووی یا نە تەرازووی «عەونی»› ٢. مێروویەکە چاوی ئاژەڵ کوێر دەکا ٣. منالی پێ‌گرتووی فێرە ڕۆیشتن ≡ ١. ستارەی پروین ٢. حشرەای کە چشم دام را کور می‌کند ٣. بچەی سرپا افتادە

**پێرەشەو[1] / pêreşew/:** ناو. پێرێشەو؛ دوو شەو پێش ‹پێرەشەو زۆر خۆش بوو› ≡ پریشب

**پێرەشەو[2]:** ئاوەڵکار. پێرێشەو؛ لە دوو شەو پێشدا ‹پێرەشەو هێنایان› ≡ پریشب

**پێرەکە / pêreke/:** ☜ **پێر**

**پێرێ / pêrê/:** ☜ **پێر**

**پێرێشەو / pêrêşew/:** ☜ **پێرەشەو**

**پێڕا / pêřa/:** ئامراز. وێڕا؛ وەل؛ لەیەل؛ دەگەڵ؛ لەگەڵ ‹پێڕای ڕێز و سلاو ...› ≡ همراه با

**پێڕاگەیشتن / pêřageyiştin/:** سەر کردن؛ لا لێ کردنەوە ≡ رسیدگی کردن

**پێڕاگەیشتوو / pêřageyiştû/:** ئاوەڵناو. ڕەسا؛ پێ‌گەیشتوو؛ پڕاوپڕ ≡ رسیدە؛ کفایت‌کردە

**پێڕس / pêřis/:** ☜ **پێرست**

**پێڕست / pêřist/:** ☜ **پێرست**

**پێڕک / pêřik/:** ناو. هەرزاڵ؛ جێگەی کەڵوپەل لە سەر دانان لە ڕەشماڵدا ≡ جایی سکومانند در چادر

**پێڕۆ[1] / pêřo/:** ناو. کولەی هێشتا باڵ لێ دەرنەهاتوو ≡ ملخ بال درنیاوردە

**پێڕۆ[2]:** ئاوەڵناو. پێڕەو: ١. نەفڕ (پەلەوەر) ٢. *[ڕێزمان]*

تایبەتمەندی وشەیێ کە بە تەنیا ناچێتە کار و دەکەوێتەوە پاشەوەی وشەیەکی ترەوە 🇮🇷 ١. ویژگی پرندەای کە پرواز نکند ٢. تابع

**پێڕووت** / pêřût/: ئاوەڵناو. پێخاوس؛ بێ پێڵاو 🇮🇷 پابرهنە

**پێڕەش** / pêřeş/: ☜ **قاپڕەش ـ٢**

**پێڕەو**[1] / pêřew/: ناو. ١. قانوون و بەرنامەی کۆمەڵ ‹لە عیراقا و بە قانوون و پێڕەو عیراقی/ کوردێک گیرا و بەند و زنجیر کرایە لاقی «گۆران»› ٢. شوێنی پیادە لە شەقامدا 🇮🇷 ١. برنامە ٢. پیادەرو خیابان

**پێڕەو**[2]: ئاوەڵناو. پێڕۆ: ١. نەفڕ (پەلەوەر) ٢. بە پێ؛ بێ ئامرازی گوزانەوە 🇮🇷 ١. ویژگی پرندەای کە پرواز نکند ٢. پیادە

**پێڕەوکە** / pêřewke/: ناو. پاڕەوکە؛ منالی پێ گرتوو 🇮🇷 بچەی سر پا افتادە

**پێڕەوگە** / pêřewge/: ☜ **پیادەڕۆ**

**پێڕێ** / pêřê/: ☜ **پیادەڕێ**

**پێڕێخەراو** / pêřêx(i)raw/: ئاوەڵناو. پێخوس؛ پاشێل 🇮🇷 پایمال

**پێز** / pêz/: ناو. ١. کێش و هێز ٢. ماک و ڕەگەز ٣. مەڕ؛ پەز 🇮🇷 ١. کش و تاب ٢. اصل و مادە ٣. گوسفند

**پێزان** / pêzan/: ئاوەڵناو. بەئەمەگ؛ چاکە لە بەرچاو 🇮🇷 باوفا

**پێزانین** / pêzanîn/: چاوگ. ١. چاکە لە بەرچاو بوون ‹حەققی ئیخلاسە، بەجێ هێنانی ئادابی خولووس/ پێبزانێ یا نەزانێ، من بە دڵ یادی دەکەم «مەحوی»› ٢. ئاگادار بوونەوە لە شتی نهێنی 🇮🇷 ١. قدرشناس بودن ٢. اطلاع یافتن

**پێزە**[1] / pêze/: ناو. ماک و ڕەگەز 🇮🇷 اصل و مادە

**پێزە**[2]: ئاوەڵناو. پیچ؛ کەم؛ هندک 🇮🇷 اندک

**پێزی** / pêzî/: ناو. بێزە؛ منالی ناوسک؛ تۆل؛ پیزە؛ پس؛ پز 🇮🇷 جنین

• **پێژ** / pêj-/: پاشەوشە. ١. ـ لێنەر ‹ئاشپێژ› ٢. ـ داڕێژ ‹خشتپێژ› ٣. ـ برژێن ‹نانپێژ› 🇮🇷 ١تا٣. ـ پَز

**پێژان** / pêjan/: چاوگ. پێژتن: ١. لە بەر تاو یان ئاگر لێنان و برژاندن ‹نان پێژان› ٢. پژاندن؛ بڵاو کردنەوە ‹ئەگەر وەک باوکە حەسرەتدیدەکەت زەهرت بچێژایە/ زەمان گەردی ئەمەلتی گشت بە دەم باوە بپێژایە «گۆران»› ٣. داڕشتن؛ داڕژتن ‹تەپاڵە پێژان؛ خشت پێژان› 🇮🇷 ١. پُختن ٢. پاشیدن ٣. ساختن (بیشتر در قالب)

**پێژاندن** / pêjandin/: چاوگ. پێژانن؛ خستنە بەر تاو یان ئاگر 🇮🇷 پُختن

**پێژانن** / pêjanin/: ☜ **پێژاندن**

**پێژتن** / pêjtin/: ☜ **پێژان**

**پێژران** / pêjran/: چاوگ. پچیای؛ پچیەی؛ کران (نان) 🇮🇷 پُختە شدن (نان)

**پێژک** / pêjik/: ناو. مێورە؛ لکە ڕەزی براوی وشک 🇮🇷 شاخەی هرس شدەی تاک

**پێژگ** / pêjig/: ناو. پیفۆک؛ گیایەکە بنەکەی دەخورێ 🇮🇷 گیاهی با ریشەی خوراکی

**پێژن** / pêjin/: ناو. ١. جووڵە؛ تەکان ٢. دەنگی شتی نادیار ٣. زایەڵە؛ گومنی؛ دۆخی دەنگ دانەوە 🇮🇷 ١. حرکت؛ تکان ٢. صدای چیزی کە پیدا نیست ٣. پژواک

**پێژەک**[1] / pêjek/: ناو. ١. خونچە؛ غونچەی گوڵ ٢. چرۆ؛ چووزەرە؛ لکی تازە و ناسکی دار و گیا 🇮🇷 ١. غُنچە ٢. جوانە

**پێژەک**[2]: ئاوەڵناو. ١. زیاد لە ئەندازەی ئاسایی ٢. نائاسایی وا کە ئەندامی زیادەی هەبێ، وەک شەش قامک 🇮🇷 ١. بیش از حد طبیعی ٢. غیرطبیعی با اندام اضافە

**پێژەن** / pêjen/: ناو. دەنووکە؛ زەخمە؛ لەتەیەکی

ناسک لە ئێسک، پلاستیک، چێو یـان کـانزا کـە سازی ژێداری پێ ئەژەنن ■ زخمه؛ مضراب

**پێژەوان** / pêjewan/: ☜ **پەژیوان**

**پێژی** / pêjî/: ناو. مەعاش؛ بژیو؛ پیوار ■ معاش

**پێژیوان** / pêjîwan/: ☜ **پەشیمان**

**پێس** / pês/: ناو. ١. ☜ **پێست** ٢. ئـاهۆ؛ پـەتا؛ نەخۆشی گیرۆ ■ ١. ☜ **پێست** ٢. واگیر

**پێسازان** / pêsazan/: ☜ **پێکەوتن ـ١**

**پێسـپاردن** / pês(i)pardin/: چـاوگ. ١. بـە ئەمانەت دانی شتێ بە کەسێ ٢. ڕاسـپاردن ٣. ئامۆژگاری کردن ■ ١. به امانت گذاشتن ٢. توصیه کردن ٣. نصیحت کردن

**پێسپێری** / pês(i)pêrî/: ناو. ڕاسپارە؛ قەوینتی ■ سفارش

**پێست** / pêst/: ناو. پێس؛ پـۆس؛ پۆسـت؛ پـووس؛ پویست؛ تۆک؛ تویخ؛ تۆخ؛ تفر: ١. مـرت؛ قـولاخ؛ کەول؛ کەڤل؛ کەوڕ؛ دۆلگ؛ دەرەکیترین بەشـی جەستەی مرۆڤ و گیانداران ‹پێستـی دەست› ٢. توێکڵ؛ تۆکڵ؛ تێکول؛ تـۆخڵ؛ تێخـۆڵ؛ تـوێخڵ؛ تۆشـڵ؛ دەرەکـیتـرین بەشـی ڕوەک ‹پێستـی خـەیار› ٣. تـۆکڵ؛ بەشـی دەرەوەی هێلکـەی گیانەوەران و ناوکەی ڕوەکان ‹پێستـی هێلکە› ■ ١تا٣. پوست

**پێستڕەش** / pêstřeş/: نـاو. قـول؛ ڕەشپێسـت ■ سیاهپوست

**پێستە** / pêste/: ناو. کەولی حـەیوانات ■ پوسـت حیوانات

⊡ **پێستە خۆش/ خۆشە کردن**: پێستە لە دەبـاغ دان ■ دباغی کردن پوست

**پێستەخۆشـکەر** / pêstexoşker/: نـاو. دەبـاغ. هەروەها: **پێستەخۆشکەری** ■ دباغ

**پێسڕ** / pêsiř/: ناو. پاکەر؛ ئامێری سـڕین و پـاک کردنەوە ■ پاککُن

**پێسوک** / pêsûk/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* چاپک؛ چالاک؛ گورج و گۆڵ ■ چست و چالاک

**پێسە**[1] / pêse/: ناو. پێستە ■ پوستەی حیوانات

**پێسە**[2]: ئاوەڵناو. ئاوا؛ ئاوها ‹کاری پێسە خاسـا، ئاننـە ویت ئەماننی› ■ چنین

**پێسە**[3]: ئاوەڵکار. وەسا؛ ئاوەها ‹ئـی هـەرمانێ پێسـە مەلۆ ڕاڤە› ■ این طور

**پێسە**[4]: جێناو. وا؛ ئاوا ‹فیدای دووریـت بـام پێسـەش کەردەن پێم/ سوەیل مایەی ڕەنگ هۆرمەگیرۆ جـێم «بێسارانی»› ■ چنین

**پێسە**[5]: ئامراز. پێسەو؛ وەک؛ چوون ‹پێسـە هـەوروو ڤەهاری هەرسی پەرزنێرە› ■ چون؛ مانند

**پێسـەلماندن** / pêselmandin/: چـاوگ. وەهـا تێگەیاندنێ کە هیچی تێدا نەمێنێتەوە ■ مُجاب کردن

**پێسەو** / pêsew/: ☜ **پێسە**[5]

**پێسیر** / pêsîr/: نـاو. پێسـێر؛ یەخـە؛ بـەرۆک ■ گریبان

**پێسیرە** / pêsîre/: ناو. بەرسیلە؛ قۆرە ■ غوره

**پێسێر** / pêsêr/: ☜ **پێسیر**

**پێش**[1] / pêş/: ناو. بەر ‹پێشی کاروان لە پاشی کاروان ئاگادار نییە «مەسەل»› ■ جلو

**پێش**[2]: ئاوەڵـناو. پێشتر لـە هـەموو؛ پێشـوو ‹ددانی پێش› ■ پیشین

**پێش**[3]: ئاوەڵکار. پێشەوە ‹هێنایە پێش› ■ جلو

⊡ **پێش خستن**: ١. بەرەو پێش بردن؛ پەرە پێ دان ٢. خستنە پێشـەوە؛ لـە دواوە ڕۆیـین بـۆ ڕێـز لێنان ■ ١. ترقی دادن ٢. جلو انداختن

**پێش خۆ دان**: مـرۆ یـا ئـاژەڵ خسـتنە بـەر خـۆ ‹پێش خۆم دان و بردمنـەوە› ■ بـە جلـو رانـدن (انسان یا حیوان)

**پێش کەوتن**: ١. کەوتنـە پـێش ‹بەیـداغمان هەلگرت ئێمە پـێش کـەوتین/ مـژدە بـێ یـاران!

دیسان سەر کەوتین «پیرەمێرد»› ٢. پێشڕەوت کردن ‹هۆی پێش کەوتنی ڕۆژاوا و بەجێمانی ئێمە چییە؟› ⊑ ١. پیش افتادن ٢. پیشرفت کردن

**پێش گرتن**: بەر لێ‌گرتن ⊑ مُمانعت کردن

**پێش هاتن**: هاتنە پێش ⊑ پیش آمدن

**پێش هێنان**: هێنانە پێش ⊑ پیش آوردن

**پێش**[4]: ئامراز. لە پێش؛ لە بەر؛ پێش لە؛ بەر لە ‹پێش چوونە ناو بیر، بیری هاتنە دەر بکە «مەسەل»› ⊑ پیش از

**پێش -**[5]: پێشوشە. ١. بەر لە ڕووداو یان کارێ ‹پێش‌فرۆش؛ پێشکەش› ٢. بەر ‹پێشاو› ⊑ ١و٢. پیش -

**پێش‌ئاوەلا** / pêş'aweła/: ئاوەڵناو. بەربەرەلا؛ بەرنەگیراو؛ پاوان‌نەکراو ⊑ آزاد و بدون انحصار

**پێشاخوڕ** / pêşaxuř/: ☜ **پەساخوڕ**

**پێشارۆ** / pêşaro/: ☜ **پێشەنگ**

**پێشان** / pêşan/: ئاوەڵکار. دە پێشدا؛ لە بەرەوە ⊑ قبلاً

**پێشاندنەوە** / pêşand(i)newe/: چاوگ. قرچقاندن؛ پلیخاندنەوە ⊑ لە کردن

**پێشاو** / pêşaw/: ناو. ١. ئاودەست؛ جێگەی دەست بە ئاو گەیاندن ٢. سەرەتای ئاوی بەردراو ٣. میز؛ مێز؛ گمێز ⊑ ١. آب‌دست؛ دستشویی ٢. آب سرآغازین آبیاری ٣. ادرار

⊡ **پێشاو بڕ دانەوە**: وە دوای کەسێک کەوتن و لە لایەکی دیکەوە هاتنە پێشی و گرتنەوەی ⊑ تعقیب کردن و از روبرو درآمدن

**پێشاهەنگ** / pêşaheng/: ☜ **پەشەنگ**

**پێشبار** / pêşbar/: ناو. ١. باری کەل‌وپەل بەڕێ‌کراو لە پێشدا ٢. *[مەجاز]* دیاری ⊑ ١. بار و بنەای کە جلو می‌فرستند ٢. اندوختە

**پێشبڕ** / pêşbiř/: ناو. بەرایی؛ پێشەکی ⊑ مُقدمە

**پێشبڕکێ** / pêşbiřkê/: ناو. کێبەرکێ ⊑ مسابقە

**پێشبڕی** / pêşb(i)ři/: ناو. بەرهەڵستی؛ بەرتەک ⊑ اعتراض

**پێشبەر** / pêşber/: ناو. ڕووگە؛ قیبلە ‹هەیا بیناهییا چەهڤان بوت و عوزرای ولاتێ مِن/ تویی پێشبەر سجوودا مِن، سەحەرگاهان د خەلوێدا «مەلای جزیری»› ⊑ قبلە

**پێشبەست** / pêşbest/: ناو. بەربەست ⊑ مانع

**پێشبەند** / pêşbend/: ناو. دەستبەندی چارەوێ ⊑ دستبند ستور

**پێشبین** / pêşbîn/: ئاوەڵناو. زۆر زانا و بە تۆژینەوە ⊑ اندیشمند

**پێش‌بینی** / pêşbînî/: ناو. چۆنیەتی خەبەر لە دوارۆژ دان؛ خەبەر لە ئاکامی کارێک دان ‹پێش‌بینی کاک هەژارە:/ ئێستا شەق بە خەروارە! «هێمن»› ⊑ پیش‌بینی

**پێش‌بێنی** / pêşbênî/: ناو. پسپێری ⊑ پیش‌بینی

**پێشت** / pêşt/: ☜ **پشت**[1]

**پێشتەماڵ** / pêştemał/: ناو. پشتەماڵ؛ مەرحەمە؛ خاولی ⊑ حولە

**پێشچاو** / pêşçaw/: ناو. دیمەن؛ چاوگە ⊑ مَنظر

**پێشخان** / pêşxan/: ناو. ڕێ و دالانی ناوماڵ ⊑ پیشخان

**پێشخانە** / pêşxane/: ناو. ژووری کەوش‌کەن بەر لە ئۆدەی دانیشتن ⊑ اتاق کفش‌کن

**پێشخڕ** / pêşxiř/: ناو. سەلەم؛ پێش‌سێن؛ پێشکڕ؛ کاری سەندن پێش پێگەیشتن ⊑ پیشخرید

**پێشخزمەت** / pêşxizmet/: ناو. نۆکەر؛ بەردەست؛ نۆکەری بەردەستان ‹چاوەکەم زانیوتە بۆچی خەو لە چاوم ناکەوێ/ چونکە مِن پێشخزمەتم، پێشخزمەتان نانوون شەوێ «کوردی»› ⊑ پیشخدمت

**پێشخوان** / pêşx(i)wan/: ناو. ١. تەپلەکی فرۆشیار ٢. پنە؛ پنێ؛ تەختە و دەپی ئەنگوتکە لە

سەر پان کردنەوە 🇮🇷 ١. میز فروشنده؛ طَبَق دستفروش ٢. پهنەی نانوایی

**پێشخۆر** / pêşxor/: ناو. بەرخۆر: ١. شینخۆر؛ زرعاتی بە شینی فرۆشراو ٢. *[مەجاز]* کاری خەرج کردنی مووچە پێش لە وەرگرتنی. هەروەها: **پێشخۆر کردن** 🇮🇷 ١. سلم فروخته ٢. پیشخور

**پێشخۆری** / pêşxorî/: ناو. دەوری؛ قاپی پەل بۆ چێشت تێدا خواردن 🇮🇷 ظرف پیشخوری

**پێشدار** / pêşdar/: ناو. چاتمە؛ کێشکچی؛ نیابان 🇮🇷 قراول

**پێشداوەری** / pêşdawerî/: ناو. کار و ڕەوتی بڕیار دان پێش لە زانیاری تەواو 🇮🇷 پیشداوری

**پێشدرگا** / pêşdirga/: ناو. دەریزانک؛ ئاستانە؛ کەوشکەن 🇮🇷 کفش‌کن

**پێشدەستی** / pêşdestî/: ناو. پێشدەسی: ١. کاری بەر لە خەڵک هاتنە دەست و هەڵ ھەلێنان ٢. دەوری بچووکی بەردەست 🇮🇷 ١. پیشدستی ٢. بشقاب

**پێشدەسی** / pêşdesî/: ☜ **پێشدەستی**

**پێشڕۆ**[1] / pêşřo/: ناو. سەرجەلە؛ سەرگەلە؛ ڕەمکێش ‹بۆ بەرەوپێش چوونی کار پێشڕۆ دەبێ ئەزموودە بێ› 🇮🇷 پیشرو

**پێشڕۆ**[2]: ئاوەڵناو. بەر لە هەموو یان بۆ پێشەوە چوو ‹دەستەی پێشڕۆ› 🇮🇷 پیشرو

**پێشڕەفت** / pêşřeft/: ☜ **پێشکەوت**

**پێشڕەو** / pêşřew/: ئاوەڵناو. لەپێش؛ پێشەنگ 🇮🇷 پیشتاز

**پێشڕەوت** / pêşřewt/: ☜ **پێشکەوت**

**پێشژمارە** / pêşj(i)mare/: ناو. کۆد ‹پێش‌ژمارەی تەلەفوون› 🇮🇷 کُد؛ پیش‌شماره

**پێشساز** / pêşsaz/: ئاوەڵناو. دروستکراو لە شوێنێکی تر، پێش بە کار هێنان 🇮🇷 پیش‌ساخته

**پێشسێن** / pêşsên/: ☜ **پێشخڕ**

**پێششەرت** / pêşşert/: ☜ **پێشمەرج ـ١**

**پێشفرۆش** / pêşf(i)roş/: ناو. کار و ڕەوتی بەر لە پێگەیشتن فرۆشتن 🇮🇷 پیشفروش

**پێشفەنگ** / pêşfeng/: ناو. چەشنێک ڕاگرتنی چەک بە قیتی و لە بەر سینگدا بۆ ڕێزنان 🇮🇷 پیشفَنگ

**پێشقلیانی** / pêşqilyanî/: ناو. بەرقلیان؛ قلیان‌قاوەڵتی؛ خۆراکی لە سەر خورێنی بەیان 🇮🇷 ناشتایی

**پێشقەرەوڵ** / pêşqerewił/: ناو. پێشەنگ؛ دیدەوەر؛ سەیارە 🇮🇷 پیشقراول

**پێشکار** / pêşkar/: ناو. ١. گزیر؛ بەردەست؛ کاربەدەستی خان و ئاغا ٢. پاکار؛ بەردەست؛ لێهاتووترین کرێکار لە کارگەیەکی سونەتیدا کە لە کاتی نەبوونی وەستاکار، سەرپەرشتی بە ئەستۆیە ٣. کرێکاری نانەوایی کە نان لە تەنوورە دەردێنێ 🇮🇷 ١تا٣. پیشکار

**پێشکان** / pêş(i)kan/: چاوگ. ١. لە عۆدە هاتن ‹زۆر پێ‌شکان؛ عەقل پێ‌شکان› ٢. خەجالەت بوون؛ تەریقەوە بوون ‹کە وە درۆیان خستەوە، زۆری پێ‌شکا› 🇮🇷 ١. از عُهده (کاری) بر آمدن ٢. شرمسار شدن

**پێشکانەوە** / pêş(i)kanewe/: چاوگ. پێ‌شکان؛ خەجالەت بوون 🇮🇷 شرمنده شدن

**پێشکرێ** / pêşk(i)rê/: ناو. پێش؛ بەیعانە 🇮🇷 پیش پرداخت

**پێشکڕ** / pêşkiř/: ناو. سەلەم‌کڕ 🇮🇷 سَلَم‌خر

**پێشکۆ** / pêşko/: ناو. ١. لووتکە؛ کەپک ٢. قەڵپووزی زین 🇮🇷 ١. دماغه ٢. قاچ زین

**پێشکە** / pêşke/: ناو. مێشوولە؛ پەخشە؛ تۆفانە 🇮🇷 پشه

**پێشکەش** / pêşkeş/: ناو. پێشکیش؛ پێشکێش؛ دیاری؛ کار و ڕەوتی دانی شتێک بە ڕێزەوە 🇮🇷

پیشکش

▣ **پێشکەش کردن** پێدانی شتێک بە ڕێزەوە ‹چی زۆر بەنرخە و من شکی ئەبەم/ نیشتمان بە دڵ پێشکەشتی ئەکەم «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ⬅ پیشکش کردن

**پێشکەشی**[1] / pêşkeşî/: ناو. پێشکێشی؛ دیاری ‹... چل سندووق فیشەکی پێ فرۆشتبوو؛ دە سندووقیشی بە پێشکەشی دابووە شۆرش... «هەژار، چێشتی مجێور»› ⬅ پیشکشی

**پێشکەشی**[2]: ئاوەڵناو. پێشکێشی؛ پێشکەش‌کراو ‹ئەسپی پێشکەشی ددانی ناشمێرن «مەسەل»› ⬅ تقدیمی

**پێشکەفت** / pêşkeft/: ☜ **پێشکەوت**

**پێشکەگێڕەوە** / pêşkegêřewe/: ناو. پەشەبەند ⬅ پشەبند

**پێشکەل** / pêşkel/: ناو. کاری لە دواوە بڕینی گوێچکەی بەرخ و کار بۆ دیاری کردن ⬅ نشانە کردن برّە و بُزغالە با بریدن گوش

**پێشکەوت** / pêşkewt/: ناو. پێشکەفت؛ پێشڕەوت؛ پێشڕەفت؛ دۆخی هەڵدان؛ پێشکەوتن ⬅ پیشرفت

**پێشکەوتن** / pêşkewtin/: چاوگ. وەپێش کەوتن: ١. هەڵدان؛ پێشڕەوت کردن ‹ئازادی و بەرامبەری ڕەمزی پێشکەوتنی گەلانە› ٢. لە بەرەوە ڕۆیشتن ‹ئێوە پێشکەون ئێمەش بە شوێنتانا دێین› ⬅ ١. پیشرفت کردن ٢. از پیش رفتن

**پێشکەوتوو** / pêşkewtû/: ئاوەڵناو. خاوەن پێشکەوتوویی ⬅ پیشرفتە

**پێشکیش** / pêşkîş/: ☜ **پێشکەش**

**پێشکێش** / pêşkêş/: ☜ **پێشکەش**

**پێشکێشی** / pêşkêşî/: ☜ **پێشکەشی**

**پێشگاییلە** / pêşgayîle/: ناو. بەرگاییلە؛ باڵندەیەکی چووکە کاتی شێف‌بڕین لە سەر خەتی جووت بە دوای کرمدا دەگەڕێ ⬅ پرندەای کرمخوار

**پێشگر**[1] / pêşgir/: ناو. ١. لەمپەر؛ بەرگر ‹هیچ پێشگرێک نەهاتۆتە سەر ڕێگای› ٢. گرێک کە خۆی بە تەنیا مانا نادا و دێتە پێش وشەوە بۆ خولقانی مانایەکی نوێ ⬅ ١. مانع ٢. پیشوند

**پێشگر**[2]: ئاوەڵناو. بەرگر ‹پێشگری کارەکە، نەبوونی پارەیە› ⬅ مانع

**پێشگرە** / pêşg(i)re/: ناو. گریمانە؛ بەربوورە ⬅ پیش‌فرض

**پێشگری** / pêşg(i)rî/: ناو. پێشگیری؛ بەرگری؛ کاری پێش گرتن ⬅ ممانعت؛ پیشگیری

**پێشگۆ** / pêşgo/: ناو. دالە؛ دوابین؛ هەواڵدەر لە داهاتوو ⬅ پیشگو

**پێشگیری** / pêşgîrî/: ☜ **پێشگری**

**پێش‌لێگر** / pêşlêgir/: ناو. گەپل؛ بەرهەڵست ⬅ مانع

**پێشمار** / pêşmar/: ناو. داواکار لە دادگا ⬅ مُدعی

**پێشماڵ** / pêşmał/: ناو. یەکەم حەمامی ژنی زەیسان ⬅ اوّلین حمام زائو

**پێشمەرج** / pêşmerc/: ناو. ١. پێش‌شەرت؛ مەرجێ کە بەر لە دەسپێکردنی کارێک دادەنرێ ‹بۆ دەسپێکردنی وتووێژەکان هیچ پێش‌مەرجێکمان نییە› ٢. بارودۆخێک کە بۆ پێکهاتنی بارودۆخێکی‌تر پێویستە ‹سەرمایە، بەڕێوبەرایەتی و زانستی کارامە، پێش‌مەرجەکانی گەشەی ئابوورین› ⬅ ١و٢. پیش‌شرط

**پێشمەرگ** / pêşmerg/: ئاوەڵناو. گیان‌فیدا ⬅ فدایی

**پێشمەرگە** / pêşmerge/: ناو. ١. گیان‌فیدا؛ ئەوەی گیانی خۆی بۆ پاراستنی گیانی خەڵک بەخت دەکا ٢. هێزی چەکداری ڕزگاریخوازی گەل ⬅ ١. فدایی ٢. نیروی نظامی آزدیخواه ملی

**پێشنوێژ** / pêşn(i)wêj/: ناو. بەرنوێژ؛ نفێژبەر؛

ئیمـام؛ وەرنمـا؛ پێشـەوای نـوێژ. هـەروەها: **پێشنوێژی** ■ پیشنماز

**پێشنووس** / pêşnûs/: نـاو. چڵکنووس؛ پیس‌نووس؛ ڕەش‌نووس؛ نووسراوەیەک پێش پێداچوونەوە ■ پیشنویس

**پێشنیار** / pêşn(i)yar/: ناو. پێشـنیاز؛ پێشـنیهاد؛ تەگبیر بۆ کارێک لە پێشدا. هەروەها: **پێشنیار دان** ■ پیشنهاد

**پێشنیاز** / pêşn(i)yaz/: ☜ **پێشنیار**

**پێشنیهاد** / pêşnîhad/: ☜ **پێشنیار**

**پێشواز** / pêşwaz/: ناو. پێشوازی؛ پیرایی؛ پـیری؛ پێـوەی؛ بەرەنـدک؛ کـار و ڕەوتی بـە پیرییـەوە چوون ‹نازت بێ، وەی نازت بێ/ کەمەرە شـل نـازت بێ/ سەرشیوی سەقز وە پێشوازت بێ «فولکلۆر»› ■ استقبال

⊡ **چونە پێشوازەوە**: بـە پیرییـەوە چـوون ■ بـە استقبال رفتن

**پێشوازی** / pêşwazî/: ☜ **پێشواز**

**پێشوازۆ** / pêşwajo/: ناو. خوێندنەوە و هەڵـە لـێ سـڕینەوەی نووسـراوە، پـێش ئـەوەی بـبرێ بـۆ سەرۆک واژۆی بکا ■ پاراف

**پێش‌وتە** / pêşw(i)te/: ناو. پێشەکی ■ پیشگفتار

**پێشۆر** / pêşor/: ناو. ١. جێگەی قـاچ لـێ‌شـوتن؛ جێگەی پـا شـۆردن ٢. بەردەپاشـۆر ■ ١. جـای شُستن پا ٢. سنگ پا

**پێشو**[١] / pêşû/: ناو. دوو دەستی یەکسم ■ دسـت ستور

**پێشو**[٢]: ئاوەڵناو. پێشین ‹ددانی پێشوو› ■ پیشین

**پێشو**[٣]: ئاوەڵکار. بەر لە؛ لە بەرێدا ‹پێشوو خەڵک وا نەدەژیان› ■ سابقاً

**پێشوتر** / pêşûtir/: ئاوەڵکار. پێشتر ■ پیشتر

**پێشولە** / pêşûle/: ناو. مێشوولە؛ پێشـکە؛ تۆفانـە ■ پشه

**پێشونە** / pêşûne/: ئاوەڵناو. لە مێژینە ■ باستانی

**پێشونیان** / pêşûn(i)yan/: ☜ **پێشینان**

**پێشوها** / pêşûha/: ئاوەڵکار. چـەلان؛ جـاران ■ قدیم‌ها

**پێشە** / pêşe/: نـاو. ١. ئێسک؛ ئیسـقان؛ هەسـتی ٢. پیشە؛ ئیش ■ ١. استخوان ٢. پیشه

**پێشەبرکە** / pêşebiřke/: ☜ **پێشەبڕکێ**

**پێشەبڕکێ** / pêşebiřkê/: ناو. بەرەوبڕ؛ پێشـەبڕکە؛ کاری ڕێ لێ‌بڕین ■ سبقت

**پێشەخۆشە** / pêşexoşe/: ناو. خۆشە؛ ناوکەخۆشـە؛ دەنکی شیرینی میوە ■ هستەی شیرین

**پێشەزا** / pêşeza/: ناو. منداڵانی ژنێ کـە نـەماوە، بۆ ژنی دووهەم، کە دواجار هاتووە ■ بچەهای زن فوت شده به نسبت زن تازه

**پێشەزرانی** / pêşez(i)ranî/: نـاو. کەشـکـەزرانی؛ کاسەئەژنۆ؛ کەشکەوژنگ ■ کاسەی زانو

**پێشەسەر** / pêşeser/: نـاو. ١. بـاڵاتر لـە تـوێڵ ٢. کاپۆڵ؛ پۆزمین؛ قاپیلکەسەر ■ ١. جاندانەی سر ٢. جُمجمه

**پێشـەکی**[١] / pêşekî/: نـاو. ١. بێـعـ؛ بەیعانـە؛ عەرەبوون ٢. کرێ لە پێش کـاردا ٣. دەسـپێک ٤. پێش‌وتە ■ ١. بیعانه ٢. پیش پرداخت ٣. مقدمـه ٤. پیشگفتار

**پێشەکی**[٢]: ئاوەڵکار. پێشووتر؛ لە پێشـوودا؛ بـەر لـە هەر شتێ ‹پێشەکی دەبێ ڕابگەیێنم من تەنیا نـیم› ■ قبل از هر چیز

**پێشـەڵ** / pêşeł/: نـاو. لای پێشـەوە. بەرانبـەر: **پاشەڵ** ■ قُدام

**پێشـەم** / pêşem/: ئاوەڵـناو. زۆر گرینـگ ■ بسـیار مهم

**پێشەنگ** / pêşeng/: ناو. پێشارۆ: ١. سـەرجەڵەی کاروان ‹گوڵاڵەی دەشت، نێرگزی مەست، وەنەوشە/ وەک پێشەنگی بەهار کەوتوونە گەشە «گۆران»› ٢.

سەرگەلەی پەز ٣. پێشەنگاو؛ ئەوەی بەر لە هەموو، کارێکی گرینگ دەکا ☰ ١. پیشاهنگ ٢. نَخراز ٣. پیشگام

**پێشەنگاو** / pêşengaw/: ☜ **پێشەنگ ـ٣**

**پێشەنەرمی** / pêşenermî/: ناو. ڕاشیتیسم؛ ئێسکنەرمی ☰ راشیتیسم

**پێشەوا** / pêşewa/: ناو. ڕێبەر؛ یەکمان؛ سەرەک هۆز ‹پێشەوای نەتەوەیی؛ پێشەوای دینی› ☰ پیشوا؛ رهبر

**پێشەوە** / pêşewe/: ناوەڵکار. لای بەرێ ‹وەرە پێشەوە› ☰ جلو

**پێشهات** / pêşhat/: ناو. پێشهاتە؛ ڕێوار؛ کەت؛ هەڵکەفت ☰ پیشامد

**پێشهاتە** / pêşhate/: ☜ **پێشهات**

**پێشی** / pêşî/: ناو. ١. نیمەڕۆ؛ نیوەڕۆ ٢. مێشوولە؛ پەخشە ☰ ١. نیمروز ٢. پشه

**پێشین** / pêşîn/: ناوەڵناو. لەمێژ؛ زۆر لە بەرێدا ☰ قدیمی

**پێشینان** / pêşînan/: ناو. پێشینیان؛ پێشوونیان؛ ڕابردوانی زوو؛ لەمێژینەکان ☰ پیشینیان

**پێشینە**[1] / pêşîne/: ناو. پێشوونە: ١. ڕابردە؛ ڕابردوو؛ ڕابوردوو؛ زانیاری لەمەڕ بەسەرهات و ڕابردووی کەسێ یان شتێکەوە ‹پێشینەی ئەو لە من بپرسن› ٢. ڕووداوێک کە پێشتر دووپات بووەتەوە ‹کوشتن و کوێر کردنی منداڵ و خزمان، لە نێو شاکاندا پێشینەی هەیە› ٣. پێشینیان؛ ڕابردوان ‹پێشینە دەڵێن کەس بە خەیاڵ نەبووە بە ماڵ «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ☰ ١و٢. سابقه ٣. پیشینیان

**پێشینە**[2]: ناوەڵناو. لەمێژینە؛ قەدیمی ☰ باستانی

**پێشینیان** / pêşîn(i)yan/: ☜ **پێشینان**

**پێشێل** / pêşêl/: ☜ **پاشێل**

**پێشێلکاری** / pêşêlkarî/: ناو. حەقکوژی؛ کار و ڕەوتی پێشێل کردنی مافی کەس یان کەسانێک ☰ حق‌کُشی

**پێشێوێن** / pêşêwên/: ناو. کەرستەی تێکەڵ کردن ☰ همزن

**پێغەم** / pêğem/: ☜ **پەیام**

**پێغەمبەر** / pêğember/: ☜ **پەیامبەر ـ١**

**پێغەمەر** / pêğemer/: ☜ **پەیامبەر ـ١**

**پێڤاژۆ** / pêvajo/: ناو. پێواژۆ؛ ڕەوت؛ ڕەوتانە ‹فێربوونا خوەندنێ پێڤاژۆیەک درێژەنە› ☰ فرایند

**پێڤەک** / pêvek/: ناو. پاشکۆ؛ زیدەک ‹پێڤەکێ ڕۆژنامەی ولات› ☰ ضمیمه

**پێقنای** / pêqnay/: چاوگ. فیکە کردن (وەک: دەنگی کەلان) ☰ سوت کشیدن

**پێقەلە** / pêqele/: ناو. گیایەکە ☰ گیاهی است

**پێک**[1] / pêk/: ناو. پیاڵەی شەراب ☰ پیک؛ جام شراب

**پێک**[2]: ئامراز. بە یەک؛ بە یەکتر؛ بە یەکدی ‹خەڵکی دنیا ڕازی دڵداری بە بێتەڵ پێک دەڵێن/ ڕاسپاردەی لاو و کیژی کوردە ئێستاکەش، شنە! «هێمن»› ☰ به هم

**پێک ـ**[3]: پێشگر. پێکدا ـ ‹پێیکهەڵچڕژان› ☰ بر هم-

**پێک**[4]: پێرۆ. ← **ڕێک‌وپێک**

**پێکئانین** / pêk'anîn/: ☜ **پێک‌هێنان**

**پێکئینان** / pêk'înan/: ☜ **پێک‌هێنان**

**پێکا ـ** / pêka-/: پێشگر. بە یەکدا؛ بە یەکا ‹پێکاچوون؛ پێکادان› ☰ ـ به هم

**پێکاچوون** / pêkaçûn/: چاوگ. مل دە بەر مل یەک نان ☰ دست به یقه شدن

**پێکادان** / pêkadan/: چاوگ. بە گژ یەکترا چوون ☰ به هم پریدن

**پێکان** / pêkan/: چاوگ. پێکای؛ پێکتەی؛ پێکانن: ١. هەنگاوتن؛ پێوە نیان ٢. *[کینایە]*

دۆزینەوەی مەبەست ‹جوانت پێکا، قسـەی منـیش هەر ئەوەیە› ≋ ١. به هدف زدن ٢. اصابه کردن

**پێکانن** / pêkanin/: ☜ **پێکان**

**پێکای** / pêkay/: ☜ **پێکان**

**پێکبڕان** / pêkbiřan/: چـاوگ. ١. مـراد حاسـڵ بوونی دڵدار و دڵبەر ٢. بە یەک ئەندازە هاتنـەوە ≋ ١. به هم رسیدن ٢. متناسب بودن

**پێکتەی** / pêktey/: ☜ **پێکان**

**پێکدا-** / -pêkda/: پێشـگر. پێکا ــ ؛ بـە یەکـدا ‹پێکدادان؛ پێکداخزان› ≋ به هم ـ

**پێکران** / pêkiran/: چاوگ. لە دەس هـاتنی کـار ‹ئەمن کاری وام پێناکرێ› ≋ از دست بر آمدن

**پێکران** / pêkiran/: چـاوگ. پێکیـان: ١. کەوتنـە بەر ئازار و سووکایەتی ٢. ئـەنگێوران؛ پێکیـان ≋ ١. مورد تحقیر و آزار قرار گرفتن ٢. مورد اصابت واقع شدن

**پێکراو** / pêk(i)raw/: ئاوەڵـناو. ئەنگاوتە؛ ئەنگێوراو؛ پێکیا ≋ مورد اصابت واقع شده

**پێکردن** / pêkirdin/: چاوگ. ١. ناچار کـردن لـە کارێکـا ٢. فریـودان و لـە خشـتە بـردن ٣. هەڵکردنی ئاگر و چرا ٤. بـە سـەر هێنـان؛ دەرد پێدان ‹نەبووی، بـزانی چـیم پـێ‌کـرد› ٥. ئەنـدازە بوون؛ بە قەد بوون ‹ئـەوەیان بچووکـە، بزانـە ئەمـە پێیئەکا؟› ٦. بە شتێ کارێ کردن ‹سەیری تـۆی گەر پێنەکەم، کوێر بم، ئەگەر چاوم بـوێ!/ وەسـفی تـۆی گـەر پـێنەکـەم، لاڵ بم، زمـانم بـۆ چییـە؟ «بێخـود»› ≋ ١. وادار کـردن ٢. فریـب دادن ٣. افروختن ۴. به سر آوردن ۵. اندازه بـودن؛ بـه چیـزی خوردن ۶. با چیزی/ وسیله‌ای کار کردن

**پێکڕا** / pêkřa/: ئاوەڵـکار. شـانبەشـان؛ هەڤـڕە؛ پێکەوە ≋ دوشادوش

**پێکز** / pêkiz/: ئاوەڵناو. هەژار ≋ تهیدست

**پێکزانین** / pêkzanîn/: چاوگ. یەکتر دیتنـەوە؛ یەکتر ناسین ≋ همدیگر را پیدا کردن یا شناختن

**پێکژین** / pêkijîn/: ☜ **پژمین**

**پێکشبهان** / pêkşibhan/: چاوگ. وێکچـوون؛ لـە ئێکتر کردن ≋ شباهت داشتن

**پێکگەیشتن** / pêkgeyiştin/: چاوگ. پێکگەیین: ١. گەیشتنە یەک؛ یەکتر گرتنەوە ‹هەر یەکەی بە لایەکـدا ڕۆیشـتن و لـەو دیـو کێوەکـە دیسـان پێکگەیشتن و پێکەوە داگەڕان› ٢. بوونـە هـاوژین ‹یەک بۆ یەکێ کەوتە تیشکە ڕشتن/ تا بوونە یەکێک و پێکگەیشتن «هەژار، *مەم و زین*»› ≋ ١. بـه هـم رسیدن ٢. ازدواج کردن

**پێکگەیین** / pêkgeyîn/: ☜ **پێکگەیشتن**

**پێکوتە** / pêkute/: ناو. ١. دەرجەی سـەربازی ٢. سمکۆڵ؛ سم بە زەویدا دانی ئەسپ ≋ ١. درجه‌ی سربازی ٢. کار سُم بر زمین کوبیدن اسب

**پێکـورت** / pêkurt/: ئاوەڵـناو. پـاکول؛ پێکـول؛ قاچقولە ≋ پاکوتاه

**پێکـوڕە** / pêkuře/: نـاو. ١. پێـرۆ؛ کوڵلـەی باڵنەگرتوو ٢. *[پلار]* نۆکـەری ناومـاڵ ≋ ١. ملخ نابالغ ٢. نوکر خانگی

**پێکوڵ**[1] / pêkuł/: ناو. پێکـۆڵ؛ پـەیکۆڵ؛ پـەیکول؛ پەیکولە؛ پێکولە؛ پێکولی؛ پەیکۆڵـێ؛ کونجرکـە؛ قونجـر؛ قونجرکـە؛ درەسـووچە؛ سـێچـوکڵ؛ سـێدانـە؛ سـێددانـە؛ سـێدیانـە؛ درکێکـی سێسووچە بە زەویدا پان دەبێتەوە و دانەکانی بۆ دەرمان دەشێ ≋ خارخسک؛ سه‌کوهک

**پێکوڵ**[2]: ئاوەڵناو. پێ کورت ≋ پاکوتاه

**پێکوڵە** / pêkułe/: ☜ **پێکوڵ**[1]

**پێکوڵی** / pêkułî/: ☜ **پێکوڵ**[1]

**پێکوەربوون** / pêkwerbûn/: چـاوگ. بـۆ شـەڕ تێکچڕژان ‹لە نزیک باتاس تووشـی یـەک بـوون و هەردوو لەشکر پێکوەربوون «حوزنی»› ≋ بـه جـان هم افتادن

**پێــکوەڕین / pêkweřîn**/: چــاوگ. [مــەجاز] شەڕەجنێو کردن ‹ساڵێک پێکوەڕین ئێستا تەقەی مامەڵەیان دێ!› ☰ دشنام به هم دادن

**پێکۆتر / pêkotir**/: ناو. گیایەکە ☰ گیاهی است

**پێکۆترە / pêkot(i)re**/: نـاو. شـەنگاڵ؛ شـەنگار؛ کاهووەکەرانــە؛ چەرمــەژووری؛ گوڵەئەشـکەوت؛ گیایەکی دەرمانییە ☰ شنگار

**پێکۆڵ / pêkoł**/: ناو. ١. سمکـۆڵ؛ سمکـۆڵان ٢. سم لە ئەرز دانی گا و جوانە گا لە کاتی شـەڕ ☰ ١. عمل سم بر زمین کشیدن اسب ٢. عمـل سـم بـر زمین کشیدن گاو نر هنگام جدال

**پێکـەبڕە / pêkebiře**/: نـاو. کرمـــی لاســـکی دەخڵخۆر ☰ کرم ساقەخور

**.پێکەر/ pêker**-/: پاشـوشـە. ١. ـهەڵکەر؛ ـڕۆشن‌کەر؛ هەڵایســـێن ‹چراپێکــەر› ٢. هۆکــاری کــردن ‹کارپێکەر؛ نان‌پێکەر› ☰ ١. افروزنده ٢. عامل

**پێکەفتگ / pêkeftig**/: ☜ **پێکەوتو**

**پێکەفتن / pêkeftin**/: ☜ **پێکەوتن**

**پێکەڵ / pêkeł**/: پێرۆ. ← **تێکەڵ‌پێکەڵ**

**پێکەنۆک / pêknok**/: ناو. نکتە؛ قسەی خـۆش ☰ لطیفه

**پێکـەنین / pêkenîn**/: چـاوگ. کـەنین؛ خـەنین ‹گوڵ بە دەم بادی سـەباوە پێکـەنی، بولبـول فـڕی/ یەعنی عاشق لازمە دوور بێ لە یاری بێوەفا «نالی»› ☰ خندیدن

**پێکـەنیناوی / pêkenînawî**/: ناوەڵـناو. کەنینـــدار؛ کەنینی؛ گاڵتەجاڕ ☰ خندەآور

**پێکەنینـدار / pêkenîndar**/: ناوەڵناو. کەنینـدار ☰ خندەدار

**پێکـەوتن / pêkewtin**/: چـاوگ. پێکــەفتن: ١. کاڵان؛ شیاو بوون ٢. لێهاتن؛ بۆ کەسـێ جـوان و لـەبار بـوون ‹ئـەم کەوایــەت پــێدەکــەوێ› ٣. پێسازان؛ کاریگەری ئەرێنی هەبوون ☰ ١. برازنده بودن ٢. (به کسی) آمدن ٣. سازگار بودن

**پێکەوتـــو / pêkewtû**/: ناوەڵـــناو. پێکــــەفتگ؛ پێکەوتــە؛ بەرکــەتی؛ جــوان‌شــیرین ☰ برازنـدە؛ خوش‌تیپ

**پێکەوتـــویی / pêkewtûyî**/: نـــاو. وڵــــێوی؛ جوانچاکی؛ شۆخ و شەنگی ☰ شوخ و شنگی

**پێکەوتە / pêkewte**/: ☜ **پێکەوتو**

**پێکەوک / pêkewik**/: ناو. گیایەکە ☰ گیاهی است

**پێکەوە[1] / pêkewe**/: ناوەڵکار. بە یەکـەوە؛ وێکـڕا؛ تێکڕا؛ وێڕ؛ پێڕا؛ دەگەڵ یەک ‹پێکەوە دەچین› ☰ باهم

⊡ **پێکەوە بون**: لە لای یـەک بـوون؛ بـە یەکـەوە بوون ‹دە ساڵ پێکەوە بووین› ☰ باهم بودن

**پێکەوە[2]**: ئامراز. لە لای یەک؛ لـە پـەنای یـەک ☰ کنارِ هم

⊡ **پێکەوە نان**: ١. لەسـەر یـەک نـان؛ نیانـە بـان یەکەوە ٢. تفەنگ لـە یـەکتر تەقانـدن ٣. بـە یەکترەوە نووساندن ٤. کۆ کردنـەوە ‹هـەر بـە کرێکاری، ماڵ و پارەیەکی زۆری پێکەوە نـا› ☰ ١. روی هم گذاشتن ٢. به هم شلیک کردن ٣. به هم چسباندن ۴. جمع کردن (دارایی)

**پێکەوە-[3]**: پێشـگر. بە یەکەوە (ڕوون کردنـەوە: دیتـە سەر چاوگ و لێکەوتەکانییەوە) ‹پێکەوەنراو› ☰ باهم

**پێکـــەوەلکاو / pêkewel(i)kaw**/: ناوەڵـــناو. پەیوەســـت؛ جـــووت؛ جفـــت؛ جوفـــت ☰ بەهم‌چسبیدە

**پێکهـات / pêkhat**/: نـاو. پێکهاتـە: ١. هەڵـکەوت؛ ڕووداو ٢. کردمان؛ چۆناوچۆنی داڕژان و دروست بوونی شتێک ‹ئەم ماڵە پێکهاتێکی قایمی هەیە› ☰ ١. رویداد ٢. ساختار

**پێکهاتن / pêkhatin**/: چاوگ. ١. پێکەوە سـازان؛ ڕێک‌کەوتن؛ سـازیان ‹هـەموو پێکهـاتین سـەر لـە بەیانی ڕێکـەوین› ٢. دروسـت بـوون؛ چـێ‌کـران

‹پاش پێکهاتنی ئەم شارە، شارۆچکەی زۆر بە دەوروبەرییەوە سەری هەڵدا› ٣. ساز بوون؛ جێبەجێ بوون ‹کارێکی کە پێک‌دێ سووک و هاسان/ پێی ناوێ هەرا و گوڕین و ڕاسان «هەژار، مەم و زین»› ▆ ١. توافق کردن ٢. تشکیل شدن ٣. انجام شدن

**پێکهاتوو** / pêkhatû/: ☜ **پێکهاتە**[٢]

**پێکهاتە**[١] / pêkhate/: ناو. ١. ☜ **پێکهات** ٢. شتی پێکهاتوو لە چەن شت ‹پێکهاتەی چاو› ٣. دامەزراوە؛ ڕێکخراوە ‹پێکهاتە سیاسییەکانی ولات› ▆ ١. ☜ **پێکهات** ٢. ساختمان ٣. تشکُل

**پێکهاتە**[٢]: ئاوەڵناو. پێکهاتوو؛ چێ‌کراو لە دوو یان چەن ماک بە شێوەیەک وا سووک و ئاسان لێک بەر نەبن ‹ئاو پێکهاتەیەکە لە ئوکسیژن و هیدرۆژن› ▆ مُرکب

**پێک‌هانین** / pêkhanîn/: ☜ **پێک‌هێنان**

**پێک‌هەڵپڕژان** / pêkhełpiřjan/: چاوگ. تێکەوەگلان؛ پێک‌هەڵپڕژان ▆ گلاویز شدن

**پێک‌هێنان** / pêkhênan/: چاوگ. پێک‌هانین؛ پێک‌ئانین؛ پێک‌ئینان: ١. ڕێک خستن؛ سازدان ٢. ئاشت کردنەوەی دوو نەیار ‹برای شەڕی پێ فرۆشت، مەلا و کەیخودای ناردە لای کە پێکیان بێنن ... «حوزنی»› ٣. جۆر کردن؛ دابین کردن؛ جێبەجێ کردن ▆ ١. انجام دادن ٢. آشتی دادن ٣. مُهیا کردن

**پێکهێنەر** / pêkhêner/: ناو. ١. دابینکەر؛ بەدیهێنەر ‹پێکهێنەری ئەم زەوی و ئاسمانە› ٢. ڕێکخەر؛ ئەو کەسەی کۆمەڵێک شت پێکەوە ڕێک دەکا و یەکیان دەخا ‹پێکهێنەری تۆڕی ئینتەرنێت› ٣. دامەزرێنەر؛ هۆی دامەزران ‹لە باری مێژووییەوە، کورد پێکهێنەری سەرەکی شاری کەرکووکن› ▆ ١. تهیه‌کننده ٢. تنظیم‌کننده ٣. تشکیل دهنده

**پێکیا** / pêkya/: ئاوەڵناو. پێکیاگ؛ پێکراو ▆ مورد اصابت واقع شده

**پێکیاگ** / pêkyag/: ☜ **پێکیا**

**پێکیان** / pêkyan/: ☜ **پێکران**

**پێکیای** / pêkyay/: چاوگ. هەنگێوران ‹پێکیای خەدەنگ موژەی نەمیدەم/ شەهید شەیدای شاباز دیدەم «بێسارانی»› ▆ مورد اصابت واقع شدن

**پێگا** / pêga/: ☜ **پێگە**

**پێگر** / pêgir/: ناو. مقاش ▆ انبُر

**پێ‌گران** / pêgiran/: ئاوەڵناو. ١. *[مەجاز]* تەمەڵ؛ لەش‌قورس ٢. قەدەمشەڕ ▆ ١. تنبل ٢. بدقدم

**پێ‌گرتی** / pêgirtî/: ئاوەڵناو. تازە فێرە ڕۆیشتن بوو ▆ نَوپا

**پێگۆز** / pêgoz/: ناو. ئامێری پێ‌گۆزانەوە ▆ وسیلەی نقلیە

**پێگە** / pêge/: ناو. پێگا؛ پایەگا: ١. قشرە؛ قشڵە؛ مۆڵگە؛ جێگەیەک بە زنجیرە ئامراز و دامەزراویەکەوە بۆ ئامانجێکی دیاریکراو (زۆرتر چەکداری) ‹پێگەی هەوایی› ٢. *[مەجاز]* جێگای کەڵک لێ وەرگرتنی هێزی چەکداری و ڕامیاری ٣. جێگا؛ جێگە؛ پلەوپایە؛ یاگێ ٤. پەیین؛ وشکە؛ وشکەی گەوڕ؛ بەرپێی مالات لە تەوێڵەدا ▆ ١و٢. پایگاه ٣. جایگاه ٤. پهن کف اصطبل

**پێگەرموک** / pêgermok/: ناو. پیاسە؛ ڕاوێچکە ▆ قدمزنی

**پێگەشت** / pêgeşt/: ناو. قەڵەمرەو؛ دەسەڵاتگە؛ ناوچە ▆ قلمرو

**پێگەیاندن** / pêgeyandin/: چاوگ. ١. بەخێو کردن؛ پەروەردە کردن ٢. ئامادە کردن ٣. شتێک بە کەس یان شتێکی‌تر گەیاندن ‹نامەکەم پێ‌گەیاند› ▆ ١. پرورده کردن ٢. مُهیا ساختن ٣. رساندن (به کسی یا چیزی)

**پێگەیشتن** / pêgeyiştin/: چاوگ. پێگەیین: ١.

تووش بوون ‹ئەو جار لە کرماشاندا پێ‌گەیشتم› ٢. گەورە بوون ‹شوکور منداڵەکانت پێگەیشتوون› ٣. گەیشتن؛ گەیین؛ بۆ خواردن باش بوون ‹شووتی پێگەیوە› ٤. هاتنە بەرەوە ‹بەرە بەرە وەرزی سەرما و سۆڵە پێدەگا› ٥. ئامادە بوون؛ ساز بوون ‹نازانم ماڵەکە تا جێژن پێدەگا یا نە؟› ☰ ١. برخوردن؛ ملاقات کردن ٢. بزرگ شدن ٣. رسیدن (محصول) ۴. فرا رسیدن ۵. کامل شدن؛ آماده شدن

**پێگەیشتو** / pêgeyiştû/: ئاوەڵناو. پێگەیو: ١. باڵغ؛ گەورەبوو ‹بەسەر چوو دەوری مەحکوومی، لە بۆ حوڕی تەقالادەم/ لە پیری کۆن و پاشکەوتووی وەکوو خۆم، لازمە لادەم/ کوڕانی پێگەیشتووی مەکتەبم ئەمڕۆکە ئەدوێنم «قانع»› ٢. لەبار بۆ خواردن (میوە) ☰ ١. رشید ٢. رسیده

**پێ‌گەیشتویی** / pêgeyiştûyî/: ناو. فەراژوو؛ فەراژی ☰ بالندگی

**پێگەیەنراو** / pêgeyenraw/: ئاوەڵناو. ڕەنێوهاتوو؛ پەروەردەکراو ☰ تربیت‌شده

**پێگەییشتن** / pêgeyîştin/: چاوگ. خاران؛ خارین ☰ عمل آمدن

**پێگەیین** / pêgeyîn/: ☜ **پێگەیشتن**

**پێل**[1] / pêl/: ناو. ١. شەپۆل. هەروەها: **پێل دان** ٢. جۆر؛ تەرز ٣. تاو؛ ماوەیەکی زۆر کەم ☰ ١. موج ٢. نوع ٣. لحظه؛ آن

**پێل**[2]: ئاوەڵناو. چاوزەق؛ چاوزاق؛ چاودەرپەڕیو ☰ چشم‌برجسته

**پێلاڤ** / pêlav/: ☜ **پێڵاو**

**پێلاقە** / pêlaqe/: ☜ **پالەقە**

**پێلشکێن** / pêlş(i)kên/: ناو. کەڵەرە؛ شەپۆل‌ڕەوێن ☰ موج‌شکن

**پێلک** / pêlik/: ☜ **پلیکان**

**پێلۆ** / pêlo/: ئاوەڵناو. چڵێس؛ زگڵەوەڕێن ☰ شکم‌پرست

**پێلۆژە** / pêloje/: ناو. پێلەوژە؛ کۆڵوو؛ پەلووژە؛ بنی تاڵوو ☰ ریشه‌ی کلفت گیاهی است

**پێلو** / pêlû/: ناو. بەڵگ؛ پەلکی چاو ☰ پلک چشم

**پێ‌لەقە** / pêleqe/: ☜ **پالەقە**

**پێلیستک** / pêlîstik/: ناو. لیستۆک؛ لەیستۆک ☰ اسباب‌بازی

**پێڵ** / pêł/: ناو. ١. پرد؛ پول ‹سەر پێڵی زەهاو› ٢. جێ دەنکی برێ دەغڵ وەک هی نۆک و لووبیا ‹نۆک پێڵی کردووە› ☰ ١. پُل ٢. کیسه دانه‌ی برخی غلات

**پێڵا** / pêła/: ☜ **پێڵاو**

**پێڵامز** / pêłamiz/: ناو. پالامز: ١. هەنگاوانە؛ قەدەمانە؛ پارەیەک کە لە بەرامبەر هاتنی کەسێک و ئەنجام دانی کارێک پێی دەدرێ ٢. کالەدڕانە؛ حەقەپێڵاو؛ پارەی کەوش کڕینی کرێکار کە خاوەن‌کار دەیدا ☰ ١. حقُ‌القدم ٢. پول کفش کارگر

**پێڵاو** / pêław/: ناو. پێلاڤ؛ پێلا؛ پالا؛ پالاو؛ پێتاو؛ پێڵە (ژنانە)؛ شەکال؛ کەوش؛ کەفش؛ سۆل؛ سۆلک؛ تسەک؛ چەمیش؛ تایاخ؛ مووزک؛ چارۆخ؛ پۆشەنی دەرەوەی قاچی مرۆڤ، زۆرتر لە چەرم یان ماکێکی نەرم، بە ژێرە و سەرەوە ☰ کفش

**پێڵاودرو** / pêławd(i)rû/: ☜ **پالادرو**

**پێڵاودور** / pêławdûr/: ناو. کەوشدروو؛ سۆلکەر؛ کەوشدوور ☰ کفشدوز

**پێڵاوکەر** / pêławker/: ناو. گۆشکار؛ کەوش‌دروو ☰ کفّاش

**پێڵگ** / pêłig/: ☜ **پێڵو**

**پێڵو** / pêłû/: ناو. پیلوو؛ پیلۆ؛ پێلە؛ پێل؛ پێلگ؛ پێلێ؛ پیەلگ؛ پەلک؛ بەلگ؛ کۆپک؛ قەپەک؛ قەپێلک؛ مشکولی؛ مچکولی؛ هەرکام لە دوو پێست یان کاژی ناسکی سەر چاوی مرۆڤ و زۆربەی گیانەوەران ☰ پلک چشم

**پێڵە**[1] / pêłe/: ناو. ١. کەوانە؛ هێڵی نیوەجەغز ٢. وردەواڵەی دەسفرۆش ٣. لاولاو؛ لەلاو ٤. بڕشتی قیچەڵپاچ (قوماش و ...) 🇮🇷 ١. منحنی نیم‌دایره ٢. اجناس دستفروش ٣. پیچک ۴. بُرش اریب

**پێڵە**[2]: ناوەڵناو. ١. پێل؛ چاوزاق؛ چاوزەق ٢. پیری بێددان 🇮🇷 ١. چشم‌برجسته ٢. پیر بی دندان

**پێڵەدار** / pêłedar/: ناو. کۆمایەک بڕە دار 🇮🇷 تودەای از هیمه

**پێڵەوار** / pêłewar/: ناو. ١. ئێزنگ؛ چیلکە و چاڵی ئاوردوو ٢. کۆلکی گەورەی وشک ‹یەکێ گەلا یەکێ دار/ یا دوو لق یا پێڵەوار «قانع»› 🇮🇷 ١. هیمه؛ هیزم ٢. کُندەی خشک درخت

**پێڵەوژە** / pêłew(i)je/: ☜ **پێلۆژە**

**پێڵەوەر** / pêłewer/: ناو. پیلەوەر؛ چەرچی؛ گەڕیدە؛ وردەواڵەفرۆش 🇮🇷 پیله‌ور

**پێڵێ** / pêłê/: ☜ **پێڵو**

**پێمجیلکە** / pêmicîlke/: ☜ **پاکۆترە**

**پێمریشکە** / pêm(i)rîşke/: ☜ **پاکۆترە**

**پێمز** / pêmiz/: ناو. جەمەک؛ مز؛ کرێ؛ حەقدەس 🇮🇷 مُزد

**پێمزک** / pêmizk/: ناو. کرێ؛ مز 🇮🇷 دستمُزد

**پێمژ** / pêmij/: ناو. پوار؛ ئامرازێکی ترومپایی بۆ هەڵمژینی تراو 🇮🇷 پوار

**پێمل** / pêmil/: ناوەڵناو. ناچار؛ ناعیلاج؛ مەجبوور 🇮🇷 مجبور

▣ **پێمل بوون**: ناچار بوون 🇮🇷 مجبور بودن

**پێمل کردن**: ناچار کردن 🇮🇷 مجبور کردن

**پێملی**[1] / pêmilî/: ناوەڵناو. زۆرەکی؛ نابەدڵی ‹کاری پێملی› 🇮🇷 اجباری

**پێملی**[2]: ناوەڵکار. لە ناعیلاجی؛ بەزۆری؛ بە نابەدڵی ‹پێملی کاری بۆ دەکەم› 🇮🇷 اجباری

**پێمەرد** / pêmerd/: ☜ **پێمێرد**

**پێمەڕ** / pêmeř/: ناو. پێمەڕە؛ مەڕک؛ مەڕ؛ بێلاسن 🇮🇷 بیل

**پێمەڕۆکە** / pêmeřoke/: ناو. نالجاخ؛ بێڵچە 🇮🇷 بیلچه

**پێمەڕە** / pêmeře/: ناو. پامەڕە؛ بێلاسن؛ بێڵی ئاسنین 🇮🇷 بیل آهنی

**پێمەڕەکاری** / pêmeřekarî/: ناو. مەردان 🇮🇷 بیلکاری

**پێمەلە** / pêmele/: ناو. پامەلە ‹بنوارە وشکەسۆفی و ڕەقسی بە هەلهەلە/ دیسان لە بەحری وشکی هەوا کەوتە پێمەلە «نالی»› 🇮🇷 شنای ایستاده

**پێمیوە** / pêmîwe/: ☜ **پارەنگان**

**پێمێر** / pêmêr/: ناو. مەلەکەلمەوت 🇮🇷 عزرائیل

**پێمێرد** / pêmêrd/: ناو. پێمەرد؛ مەلکەمووت؛ مەلکەلمەوت؛ ئیزراییل؛ فریشتەی گیان کێشان 🇮🇷 عِزرائیل

**پێمێو** / pêmêw/: ناو. دارێ کە بۆ ڕەزی دەچەقێنن ڕایگرێت 🇮🇷 پشتیبانەی تاک

**پێن**[1] / pên/: ناو. ١. لەقە؛ کاری بە لاق لێدان ٢. پاژنە؛ پانیە 🇮🇷 ١. لگد ٢. پاشنه

**پێن**[2]: ☜ **پان**

**پێنازان** / pênazan/: چاوگ. پێنازین؛ فەخر پێکردن 🇮🇷 مُباهات کردن

**پێنازی** / pênazî/: ناو. شانازی 🇮🇷 مُباهات

**پێنازین** / pênazîn/: ☜ **پێنازان**

**پێناس** / pênas/: ناو. پێناسە؛ ناسنامە؛ بەڵگەی فەرمی ناسینەوە ‹چۆنە دەڵێن با ئاوا بێ؟/ زەرد بێ، سوور بێ/ .../ یا ڕەشێکی وەک قەتران بێ؟/ لەم ژینەدا بە حەسرەت بووم/ تەنیا ڕۆژێک/ پێناسێکی زێدی خۆمم لە گیرفان بێ «پەشێو»› 🇮🇷 شناسنامه

**پێناساندن** / pênasandin/: چاوگ. ناساندن بە کەس یان شتێک 🇮🇷 مُعرفی کردن

**پێناسە** / pênase/: ناو. ١. ڕەوتی ناساندن ٢. ☜

**پێتاس** ☰ ۱. معرفی ۲. ☜ **پێناس**

**پێناسین** / pênasîn/: چاوگ. ناساندن؛ کردنە شناس ☰ مُعرفی کردن

**پێناو** / pênaw/: ناو. ڕێباز؛ ڕێگە ☰ راه

▣ **لە پێناو**: بۆ خاتر؛ بە هۆ ‹چاکە دایم هەر لە پێناوی خراپا ون بووە/ گەوهەری دەریا بە دایم وا لە ژێر خاشاکەوە! «قانع»› ☰ به خاطرِ

**پێنج**[1] / pênc/: ناو. پەنج؛ پاژ؛ یەک و چوار؛ ژمارەی دوای چوار و بەر لە شەش ☰ پنج

**پێنج**[2]: ئاوەڵناو. پەنج؛ پاژ: ۱. یەکێ زۆرتر لە چوار دانە ‹پێنج کتێب› ۲. پێنجەم؛ پێنجەم ‹نهۆمی پێنج› ☰ ۱و۲. پنج

**پێنجخشتەکی** / pêncxiştekî/: ناو. بەندە شیعرێکی پێنجلەتی ☰ مُخمس

**پێنجسەد**[1] / pencsed/: ناو. پێنسەد؛ پانسەد؛ پانسەو؛ ژمارەیەک زیاتر لە چوارسەد و نەوەد و نۆ ☰ پانصد

**پێنجسەد**[2]: ئاوەڵناو. پێنسەد؛ پانسەد؛ پانسەو: ۱. دانەیەک زیاتر لە چوارسەد و نەوەد و نۆ ۲. پێنسەدەم ☰ ۱و۲. پانصد

**پێنجسەدەم** / pencsedem/: ئاوەڵناو. پێنجسەدەم؛ پێنسەدەم؛ پانسەدەم؛ لە ڕیز، پێگە یان جێگەی پانسەددا ☰ پانصدم

**پێنجسەدەمی** / pencsedemî/: جێناو. پانسەدەمی؛ پێنسەدەمی؛ لە ڕیز، پێگە یان جێگەی پانسەدەمدا ☰ پانصدمی

**پێنجسەدەمین** / pencsedemîn/: ئاوەڵناو. پێنسەدەمین؛ پانسەدەمین؛ لە ڕیز، پێگە یان جێگەی پانسەدەمیدا ☰ پانصدمین

**پێنجفەرزە** / pêncferze/: ☜ **پێنجوەختە**

**پێنجم** / pêncim/: ☜ **پێنجەم**

**پێنجوەختە**[1] / pêncwexte/: ناو. پێنجفەرزە؛ هەموو کاتەکانی نوێژ ☰ پنج وقت نماز

**پێنجوەختە**[2]: ئاوەڵکار. *[کینایە]* پێنجفەرزە؛ هەموو کاتێ؛ دایمودەرهەم ‹پێنجوەختە خزمەتی دەکەن› ☰ همواره

**پێنجۆک** / pêncok/: ناو. ۱. ☜ **پووکاوڵ** ۲. بازەڵێن ☰ ۱. ☜ **پووکاوڵ** ۲. نوعی بازی با شن

**پێنجۆکانێ** / pêncokanê/: ناو. گەمەیەکە بە میچ دەکرێ ☰ نوعی بازی با شتالنگ

**پێنجەم** / pêncem/: ئاوەڵناو. پەنجم؛ پەنجوم؛ پاژن؛ پێنجم؛ بە ڕیز، پلە یان جێگەی پێنجەوە ☰ پنجم

**پێنجەمی** / pêncemî/: جێناو. پەنجومی؛ پەنجەمی؛ ئەوەی لە ڕیز و جێگەی پێنجەمدایە ☰ پنجمی

**پێنجەمین** / pêncemîn/: ئاوەڵناو. پەنجومین؛ پێنجهەمین؛ بە ڕیز، پلە یان جێگەی پێنجەوە ☰ پنجمین

**پێنجهەمین** / pênchemîn/: ☜ **پێنجەمین**

**پێنجی** / pêncî/: ☜ **پەنجا**

**پێندڤە** / pêndive/: ناو. کرێژی هەنگوین کە لە کەندوودا دەمێنێتەوە ☰ موم باقیمانده در کندو

**پێندەفە** / pêndefe/: ناو. سنت؛ نێتر؛ ماکێکە هەنگ دیواری خەلیفی پێ سواغ دەدا ☰ مادەای که زنبور بر کندو می‌مالد

**پێنژ** / pênj/: ☜ **پژمە**

**پێنسەد** / pênsed/: ☜ **پێنجسەد**[1]

**پێنسەدەم** / pênsedem/: ☜ **پێنجسەدەم**

**پێنسەدەمی** / pênsedemî/: ☜ **پێنجسەدەمی**

**پێنسەدەمین** / pênsedemîn/: ☜ **پێنجسەدەمین**

**پێنسەدهەزار** / pênsedhezar/: ناو. کروور؛ کولور ☰ کرور

**پێنگاڤ** / pêngav/: ناو. هەنگاو؛ شەقاو ☰ گام

**پێنوێن** / pên(i)wên/: ناو. نوانە؛ خشتە ☰ نمودار

**پێنۆک** / pênok/: ناو. وەنەوز؛ وێژنگ؛ چۆنیەتی

خەو بردنەوە ☰ پینکی

**پێنووس** / pênûs/: ناو. قەڵەم؛ ئاڵا؛ بنووس؛ خامە؛ کلک؛ ئامرازی نووسین ‹پەنجەکەم ئەو پەنجەیە کاتێ کە پێنووسی ئەگرت/ شیعری کوردیم پێ ئەنووسی، هەر لە یەک هەتتا هەزار «قانع»› ☰ قلم

**پێنەزان** / pênezan/: ناوەڵناو. سپڵە؛ ناسپاس ‹شێتان شێت ئەبن، ئەچنە کەسنەزان/ خۆ من شێتی تۆم، سپڵەی پێنەزان! «فولکلۆر»› ☰ ناسپاس

**پێنەزانی** / pênezanî/: ناو. ناشوکری؛ سپڵەیی ☰ ناسپاسی

**پێنیژ** / pênîj/: ناو. ئاروشک؛ پژمە؛ پشمە ☰ عطسه

**پێو**[1] / pêw/: ئامراز. *[سووکەڵە]* ١. بە ئێوە؛ بەنگۆ؛ پێتان ٢. بە تۆ ‹وتم پێو› ☰ ١. به شما ٢. به تو

**• پێو**[2]: پاشەوشە. ١. ـ گەڕ؛ ـ گێڵ ‹ئاسمانپێو› ٢. پێوەر؛ ئەندازەگر ‹گەرماپێو› ☰ ١. ـ پیما ٢. ـ سنج

**پێوار** / pêwar/: ناوەڵناو. پیوار؛ نادیار؛ نەدیار؛ نە لەربەرچاو ‹مازە پەشێویان بە ڕووش وە هەمدا/ نەک پێوار بۆ مانگ نە دڵی تەمدا «سەیدی»› ☰ غیب؛ ناپیدا؛ پنهان

**پێوارناسی** / pêwarnasî/: ناو. عیلمی غەیب؛ زانستی ڕازە نهێنییەکان ☰ علم غیب

**پێوارۆ** / pêwajo/: ☜ **پێڤاژۆ**

**پێوان**[1] / pêwan/: چاوگ. پیڤان؛ پێوانن: ١. ڕۆیشتن؛ ڕێگا برین؛ پیمەی؛ پیمای؛ ڕانە لوەی ‹دنیام پێوا قوژبن و سووچ/ ڕەتاندمت بە پڕ و پووچ «پیرەمێرد»› ٢. پێوتن؛ قەرساندن؛ ئەندازە گرتن ‹ئەگەر خۆشیان بۆیان پێوان، یان بە کێشانەیان پێ دان، لێی کەم دەکەن! «هەژار، قورئان»› ☰ ١. پیمودن ٢. اندازه گرفتن

⊡ **قوڕ پێوان**: خۆ لە قوڕ نان؛ زۆر تازیەبار بوون ‹دەڵێم: کوا کاکی من؟ کوا بابی من؟ کوا نووری ئیمانم؟/ بڵێم: دوای تۆ براکەت کاری قوڕپێوانە، سووتانە «ئاوات»› ☰ خود را گِل گرفتن

**گو بە کلاو (کەسێ) نەپێوان**: بە هیچ حیساب نەکردن؛ بایەخ پێ نەدان ‹... دەگەڵ مەلا [جەمیل] لە زۆر دەرگامان دا، کەس گووی بە کلاومان نەپێوا! «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ تره (برای کسی) خُرد نکردن

**پێوان**[2]: ناو. زێرەڤان؛ پارێزڤان؛ پاسەوان ☰ نگهبان

**پێوانن** / pêwanin/: ☜ **پێوان**[1]

**پێوانە** / pêwane/: ناو. ١. پەیمانە؛ پێوەر؛ ئەنگارە؛ کەوچ؛ کیلە؛ میهەنگ؛ ئەیارە؛ ئایەرە؛ ئیارە؛ کیلەمەن؛ پیاڵە یان کاسەیەک بۆ پێوان ‹پێوانەیەک شیر؛ دوو پێوانە ئارد› ٢. جام؛ پیاڵەی شەراو ‹پیاو بۆ خۆ بمێنێ ماڵی دنیاشی دەبێ/ پێوانە هەڵێک بەتاڵە زۆر جاری پڕە «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ☰ ١. پیمانه ٢. ساغر

⊡ **پێوانە کردن**: پێوان؛ بەراورد کردن بە پێوانە ☰ اندازه گرفتن

**پێوپا** / pêwpa/: ناو. گەرای تازە دەرهاتووی گیان نەگرتووی مێروو ☰ تخم تازه و بی‌جان حشره

**پێوپل** / pêwpil/: ناو. ١. پاوپل؛ پا و پەنجە؛ لاق و لەتەر ٢. *[مەجاز]* توانایی و لێهاتوویی ‹پیر بووم و پێوپلی کارم نەماوە› ☰ ١. پا و پنجه ٢. توانایی

**پێوپلڕەش** / pêwpilřeş/: ناوەڵناو. بێ‌فەڕ ☰ منحوس

**پێوتن** / pêwtin/: چاوگ. پێوان؛ ئەندازە گرتن ☰ اندازه گرفتن

**پێوتن** / pêwitin/: چاوگ. بە کەسێ (شتێک) گوتن ☰ به کسی گفتن

**پێودان** / pêwdan/: ناو. ١. ڕێوشوێن؛ دەستوور ‹هەر بەو پێودانە کە بۆت داناوە/ هەر دێت و دەچێ هیچی نەسواوە «پیرەمێرد»› ٢. *[مەجاز]* پێودانک؛

ئەندازە 🇮🇷 ١. راه و روش ٢. اندازه

**پێودانک** / pêwdanik/: ناو. پێودان 🇮🇷 اندازه

**پێودانگ** / pêwdang/: ناو. ئەندازە 🇮🇷 اندازه

**پێور** / pêwir/: ناو. ١. پێروو؛ ئەستێرەیەکە لە کۆدا ٢. نێزەک؛ شۆڵە؛ تیرئەستێرە 🇮🇷 ١. پروین ٢. شهاب

⊡ **پێور مێزین**: ڕاخوشینی نێزەک 🇮🇷 اُفتادن شهاب

**پێوران** / pêwran/: چاوگ. پیمیای؛ قەرسان 🇮🇷 اندازه شدن

**پێورە** / pêwire/: ناو. ئاخر بەری وێنجە کە تەواو بەرز نابێ و گوڵ ناکات 🇮🇷 آخرین ثمر یونجه که رشد کامل ندارد

**پێوڕێ** / pêwřê/: ناو. پا؛ پێ؛ ڕەوت؛ شێوە 🇮🇷 روال؛ منوال

**پێوقەدەم** / pêwqadam/: ناو. [مەجاز] ڕەوتی هاتن و ئامادە بوون لە شوێنێک 🇮🇷 قدوم

**پێوقەدەمشەڕ** / pêwqedemşeř/: ئاوەڵناو. کۆدقەلین؛ بەدودم؛ شووم 🇮🇷 شوم

**پێومان** / pêwman/: ناو. پێوەر؛ سەنگ 🇮🇷 معیار

**پێوه**[1] / pêwe/: ئاوەڵکار. بە یەکەوە؛ پێکەوە 🇮🇷 باهم

**پێوه -**[2]: پێشگر. پۆ؛ لە پێش چاوگ و لێکەوتەکانی جێگر دەبێ، چاوگی لێکدراو یان ئاوەڵناو پێک دێنێ ‹پێوەدەر› 🇮🇷 در ترکیب با مصدری ساده، مصدر مرکب می‌سازد

⊡ **پێوەبوون**: ١. لە تەڵە و داو گیر کردن ‹تەڵەم بۆ کەروێشک دانابوو، ڕێوییەک پێوە بووە› ٢. [مەجاز] تووش بوون بە شتی ناخۆشەوە ‹خراپ پێوە بووم نازانم چ بکەم› ٣. بە تەما بوون؛ قەست کردن ‹پێوە بووم بێم بۆ لات› ٤. دارای شتێ بوون ‹چ شۆڕێکی جونوونی پێوەیە بای ئەم بەهارانە/ لە شارا هەر زڕەی زنجیرە، سەحرا شۆڕشی بولبول «مەحوی»› 🇮🇷 ١. در دام افتادن ٢. گرفتار شدن ٣. قصد کردن ٤. با خود داشتن

**پێوەتلان**: [مەجاز] پێوەبوون؛ لەخۆڕا تووش بوون بە ڕووداوێکی ناخۆش ‹گەندەڵی هەموو لایەکی داگرتبوو، ئەویش پێوەتلا› 🇮🇷 ناخواسته گرفتار و آلوده شدن

**پێوەتەقین**: وێک‌کەوتن 🇮🇷 تماس پیدا کردن

**پێوەچوون**: ١. سەردان بە هۆیەکی خۆش یان ناخۆشەوە ٢. چوونە ناو ٣. تێوەگلان؛ بێهۆ ڕەگەڵ ڕەوتێک کەوتن ‹گەندەڵەکانی ئیدارەیان هەموو لە سەر کار لابرد، ئەویش پێوەچوو› 🇮🇷 ١. دیدار کردن ٢. داخل شدن ٣. درگیر شدن

**پێوەچەسپان**: ☜ **پێوەلکان**

**پێوە دان**: ١. گەستن ‹پێوە دان خۆشترە لە گیزەگیز «مەسەل»› ٢. داخستن؛ بەستن؛ دەرگا و پەنجەرە جووت کردن ‹ماڵی دڵ شێوێ کە تاجی عەشقبازی نایە سەر/ وا لە خۆی قاپی ویقار و ئیعتیباری پێوە دا «ناری»› ٣. پێوەنووساندن ‹نانەکەی پێوە دە!› 🇮🇷 ١. نیش زدن ٢. (بر) بستن ٣. بر چیزی چسباندن

**پێوەدران**: بەستران؛ بەسران؛ داخران 🇮🇷 چفت و بست شدن

**پێوەراهاتن**: هۆگر بوون؛ خوو پێوە گرتن 🇮🇷 خوگرفتن

**پێوە روان**: جووت بوونی سەگ و تانجی 🇮🇷 جفتگیری کردن سگ و تازی

**پێوە رۆیشتن**: دەست بەر نەدان لە مەبەست 🇮🇷 پایمردی کردن؛ کوتاه نیامدن

**پێوەژەن**: تێوەژاندن؛ بە شتی نووک‌تیژ تێ‌کوتان 🇮🇷 با شیئ نوک‌تیز زدن

**پێوەکردن**: ١. هۆنینەوەی مووروو بە داو ٢. پل بە شیشەوە کردن ٣. بز دان؛ قامک بۆ قوون بردن ٤. پێوەهەڵاوەسین؛ ئاویزان کردن ٥.

ڕەت کردن لە کون ‹پێوە کردنی بەن بە دەرزییەوە› ≡ ١. به رشته کشیدن ٢. به سیخ کشیدن ٣. انگولک کردن ٤. آویختن ٥. از سوراخ رد کردن

**پێوەگرتن:** داپۆشینی شتێ بە شتێ‌تر ≡ پوشانیدن چیزی با چیز دیگر

**پێوەلکان:** پێوەنووسان؛ پێوەچەسپان. هەروەها: **پێوەلکاندن** ≡ بر هم چسبیدن

**پێوەنازین:** پێ‌نازین؛ فەخر پێ‌کردن ≡ به چیزی مُباهات کردن

**پێوەنان:** ١. لێ‌جووت کردن؛ لێ‌زیاد کردن ٢. بە تیر لێ دان ٣. دار بە ئاگرەوە نان ≡ ١. چسبانیدن ٢. با تیر زدن ٣. هیمه بر آتش نهادن

**پێوەنوسان:** پێوە لکان؛ پێوە چەسپان ≡ به چیزی چسبیدن

**پێوەنوساندن:** دالکاندن؛ ڕەساندن؛ دالکانن ≡ چسباندن

**پێوەنیشتن:** ١. غاردان بە کۆمەڵ بۆ شتێ ٢. بە شتێکەوە نیشتن ≡ ١. دویدن گروهی برای چیزی ٢. روی چیزی نشستن

**پێوەهاتن:** ١. بەخت هێنان ٢. سەر لێ دان بە بۆنەیەکەوە ≡ ١. شانس آوردن ٢. عیادت رفتن

**پێوەهەڵاوەسین:** ☜ **پێوەکردن ـ٤**

**پێوەدراو** / pêwed(i)raw/: ئاوەڵناو. داخراو؛ هەڵپێکراو ≡ بسته

**پێوەدەر** / pêweder/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی جانەوەری چزدار و بە ژەهر ≡ نیش‌زن

**پێوەر** / pêwer/: ناو. ١. کەس یان ئامێرێ کە دەپێوێ ‹پێوەری ئاو و کارەبا› ٢. پۆی تەون ٣. بەڵا و دەرد و زیان ٤. سەنگ؛ پێومان؛ ئەوەی چەند و چۆنی شتەکانی پێ هەڵدەسەنگێنن ٥. ئەوەی ئەندازەکانی ناسێنەری چییەتی شتێکە ‹پێوەرەکانی دیموکراسی› ≡ ١. اندازەگیر ٢. پود قالی ٣. گزند ٤. معیار ٥. شاخص

**پێوەرە** / pêwere/: ناو. ١. دارەداری منداڵ ٢. دوابەری وێنجە ٣. کێکە؛ پێوانە ≡ ١. تاتی ـ تاتی بچه ٢. آخرین بر یونجه ٣. پیمانه

**پێوەستان** / pêwestan/: چاوگ. دەرۆست هاتن؛ دەرەقەت هاتن ≡ حریف شدن

**پێوەن** / pêwen/: ناو. پێوەند: ١. ئاشنایەتی؛ پەیوەند ٢. پەیوەن؛ دۆخی پێکەوە لکان ٣. زنجیری قاچی ئەسپ و زیندانی ‹بووکی ئازادیم ئەوێ، خوێنم خەنەس بۆ دەست و پێی/ حەڵقە حەڵقەی پێوەنم بۆ پلپلە و لەرزانەیە «قانع»› ٤. پاوەن؛ سندم؛ ئاڵقەیەک لاقی چارەوای پێ کۆت دەکەن، نەڕوا ≡ ١. علاقه ٢. پیوند ٣. شِکال ٤. پابند

**پێوەند** / pêwend/: ☜ **پەیوەند**

⊡ **پێوەند کردن:** */کینایە/* گیرۆدە کردن ‹عەقل و خیرەدی بردووم، نەشئەی قەدەحی چاوت/ پێوەندی هەوای کردووم، تا زوڵفی پەرێشانت «بێخود»› ≡ وابسته کردن

**پێوەندی** / pêwendî/: ☜ **پەیوەندی**

**پێوەندیدار** / pêwendîdar/: ☜ **پەیوەندیدار**

**پێوەنوساو** / pêwenûsaw/: ئاوەڵناو. دالکاو ≡ چسبیده

**پێوەنوسێن** / pêwenûsên/: ئاوەڵناو. زامقی؛ لک؛ نووسەک ≡ چسبناک

**پێوەی** / pêwey/: ناو. پێشوازی؛ پیرایی ≡ استقبال

**پێویس** / pêwîs/: ☜ **پێویست**

**پێویست** / pêwîst/: ئاوەڵناو. پێویس؛ پێداویست؛ پێویستی؛ زەروور؛ تەوزێ؛ پێدەڤی ‹کاری پێویست؛ دەستووری پێویست› ≡ ضروری

⊡ **پێویست بون:** ئەوەجە بوون ‹زیندوو پێویستی بە هاودەم هەیە/ بۆ مردوو مردن هەر ئەفسانەیە

«هـێمن»). هـەروەها: **پێویست کـردن** ▤ لازم بودن

**پێویستن** / pêwîstin/: چـاوگ. پێویـسـت بـوون؛ پێداویست بوون ‹دەلیلی چاک و پـاکی پـێ دەوێ وەسلی ڕوخ و زولفی / خـودا شـادی بـە شـانەی دا، سەفای جەننەت بە ئاوێنـە «وەفـایی»› ▤ ضـرورت داشتن

**پێویستەکی** / pêwîstekî/: ئاوەڵـناو. زۆر پێویـسـت بۆ جێبەجێ کردن ‹ئەم پلانە پێویستـەکییە و نابـێ پشت گوێ بخرێت› ▤ لازم‌الاجرا

**پێویستی** / pêwîstî/: ناو. پێویسی: ١. پێداویستی؛ ئەوەجەیی؛ وەجـەیی؛ ئـەوەی کـە هـەبوونی بـۆ شتێ یان بەدیهاتنی دۆخێ پێویست بێ ٢. نیـاز؛ ئەوەجە؛ هەڤـجە؛ دۆخ یـان چۆنیـەتی پێویسـت بوون ▤ ١و ٢. ضرورت

**پێویسی** / pêwîsî/: ☜ **پێویستی**

**پێوێران** / pêwêran/: چاوگ. دەرەقەت هاتن ‹لە سێبازدا کەس پێم ناوێرێ› ▤ از پس برآمدن

**پێهاتن** / pêhatin/: چـاوگ. ڤەناسـین؛ دان پێـدا نان؛ مکووڕ بوون ▤ اقرار کردن

**پێهنماڵ** / pêhinmał/: ☜ **پاشێل**

**پێهورچە** / pêhurçe/: نـاو. گیایـەکی گەلاپانـە ▤ گیاهی است

**پێهـەڵ** / pêheł/: نـاو. پێهـەلا؛ ڕووەوبـەرەژوور؛ سەربەرەوژوور ▤ سربالایی

**پێهەلا** / pêhela/: ☜ **پێهەڵ**

**پێهـەڵپرژان** / pêhełpirjan/: چاوگ. پێهەڵـپژان: ١. شتی تەوش لە خوارەوە پرژاندن بە شـتێکا ٢. *[مەجاز]* کێشە تێ هالاندن و شەڕ پێ فرۆشـتن ▤ ١. پاشیدن ٢. بهانەجویی کردن

**پێهـەڵپڕژان** / pêhełpiȓjan/: چـاوگ. تێـکبـەر بوون ▤ بە هم پریدن

**پێهەڵپژان** / pêhełp(i)jan/: ☜ **پێهەڵپرژان**

**پێهەڵپەسـارتن** / pêhełpesartin/: چـاوگ. پـێهەڵپەسـاردن؛ پـاڵ دانی شـتێک بـە شتێکی‌ترەوە ▤ تکیه دادن چیزی به چیز دیگر

**پێهەڵپەسـاردن** / pêhełpesardin/: ☜ **پێهەڵپەسارتن**

**پێهەڵچوون** / pêhełçûn/: چاوگ. پێداهەڵـچوون؛ هەڵگەڕان بە دار یان بـە شـاخدا ▤ بـالا رفـتن از درخت یا کوه

**پێهەڵقوڕانـدن** / pêhełquřandin/: چـاوگ. پەژقاندن ▤ در گلو ریختن

**پێهـەڵکالان** / pêhełkałan/: چـاوگ. پێ‌هەڵکالین؛ قسە بـە ئێرەیـی کـردن ▤ حـرف حسودانه زدن

**پێهەڵکالین** / pêhełkałîn/: ☜ **پێهەڵکالان**

**پێهەڵکـەوتن** / pêhełkewtin/: چـاوگ. ١. پـا هەڵکەفتن؛ هەڵەنگووتن ٢. *[مەجاز]* هەڵـە کـردن ▤ ١. سکندری رفتن ٢. اشتباه کردن

**پێهەڵگرتن** / pêhełgirtin/: چاوگ. ١. پا گرتنی منداڵ ٢. خێرا تر ڕۆیشتن ▤ ١. سر پا افتادن بچه ٢. شتاب گرفتن در راه رفتن

**پێهەڵگوتن** / pêhełgutin/: چاوگ. پەسـن دان؛ تاریف کردن ▤ مدح کردن

**پێهەڵگەڕان** / pêhełgeřan/: ☜ **پێداهەڵگەڕان**

**پێهەڵمیزتن** / pêhełmîztin/: ☜ **پێداهەڵمیزتن**

**پێهەڵمیزین** / pêhełmîzîn/: ☜ **پێداهەڵمیزتن**

**پێهەڵهێنەر** / pêhełhêner/: ئاوەڵناو. بەرزەوەکـەر ‹چییـە ئـەم دەنگـە؛ ئـەم ئـاوازە دوورە؟/ کـە پێهەڵهێنەری چاوی شعوورە؟ «گۆران»› ▤ بازکننده

**پێیانەڕێ** / pêyaneřê/: ☜ **پیادەڕۆ**

**پێیدا** / pêyda/: ☜ **پێدا**[1]

**پێیین** / pêyîn/: ناو. لای لاقـان؛ لای خـوارووی ‹بـا فەقێیانم بۆ بێننە پێیین/ با مەلایانم بۆ بێنـە سـەرین «فولکلۆر»› ▤ طرف پایین

# ت

**ت**[1] / t/: پیت. پێنجەم پیتی ئەلفوبێی زمانی کوردی ت؛ نشانەی پنجمین حرف الفبای زبان کُردی

▪ **ت**[2]: جێناو. ١. جێناوی کرۆکی لکاو بۆ دووهەم کەسی تاک ‹خواردت؛ بردت؛ پێتدام؛ نەتدامێ› ٢. جێناوی بەرکاریی لکاو بۆ دووهەم کەسی تاک ‹بردتیان بۆ دەرەوە؟ هێناتیانەوە؟› ٣. جێناوی خاوەنداریەتی لکاو بۆ دووهەم کەسی تاک ‹سوێندم بە سەرت؛ ماڵەکەت خۆشە!؛ چاوت جوانە› ١. ضمیر متصل فاعلی دوم شخص مفرد ٢. ضمیر متصل مفعولی دوم شخص مفرد ٣. ضمیر متصل ملکی دوم شخص مفرد

**ت** / ti/: ناو. ناوی پێنجەمین پیتی ئەلفوبێی زمانی کوردی ت؛ پنجمین حرف الفبای زبان کُردی

**تئۆک** / ti'ok/: ناو. تاووک؛ تاوڵ؛ چادر؛ ڕەشماڵ خیمه

**تا**[1] / ta/: ناو. ١. هەودا؛ تاڵ ‹تا تایی سەری توڕڕەیی پڕ پێچشی با دا/ هەر تایەکی باریکی گوڵ و نافە بە بادا «نالی»› ٢. لکەدار و گیا ٣. یاو؛ نۆبەتی؛ تا و لەرز ‹ئەکا دەفعی هەزار تا و لەرز و تیفۆس/ کەنینێکی جنێوی تاڵی خورشید «بێخود»› ٤. قاپی تەرازوو ‹بۆ قیمەتی تۆ تاجی کەی و تەختی سولەیمان/ کێشانە بکەن، سووکە لە ناو تایی تەرازووت «قانع»› ٥. لنگە؛ لف؛ کەرستەی هاوماڵ یان هاولفی یەکێکی‌تر کە پێکەوە بە کار دێن ‹تایێ کەوش› ٦. لۆیەکی قوماش ‹بە تای کراس ئەگەڕێ› ٧. قەد؛ دەق ‹تا کردن› ٨. جەم؛ یەکەی شتومەکی نێو گۆنی ‹چوار تا پیاز› ١. تار؛ رشته (از نخ، مو و ...) ٢. شاخه ٣. تب ۴. کفەی ترازو ۵. لنگه (کفش و ...) ۶. یک لایه (پوشاک) ۷. شکن؛ تا (کاغذ و ...) ۸. لنگه؛ عدل (پیاز و ...)

▣ **تا بوون**: داهاتنەوە؛ نووشتانەوە؛ دانووشتان تا شدن

**تا کردن**: نووشتاندنەوە تا کردن

**تا**[2]: ئاوەڵناو. لف؛ هاوتا؛ وێنە؛ لنگە؛ هاولف؛ هاوماڵ؛ هاوشان؛ هاوچەشن ‹تای نییە› مُشابه

**تا**[3]: ئامراز. هەتا؛ هەتاکوو؛ هەتاوەکوو؛ هەتاکوانێ؛ هەتاکینێ؛ هەتاوەکوونێ؛ هەتاوەکینێ؛ هەتانێ؛ هەتاکەتێ؛ هەتاکەتانێ؛ هەتاوەکی؛ تاوەکی: ١. ئامرازی مەرج ‹تا نەگریا ئاسمان و تەم ولاتی دانەگرت/ گوڵ چەمەن‌ئارا نەبوو هەم لێوی غونچە وا نەبوو «نالی»› ٢. نیشانەی مەودای کاتی یان شوێنی لەگەڵ مەبەستدا ‹تا کۆتایی؛ تا سبەی؛ تا کرماشان› ٣. بۆ ئەوەی ‹دایهێنا تا دەستی پێ بگا›

٤. بە دوویدا ‹وەرە تا بڕۆین› ٥. ئەوەنـدەی ‹تـا دەتـوانی لەسـەرخۆ بـە!› ٦. یـان؛ وتـەی ڕیـژە و بەراورد ‹من بەرزم تا ئەو› 🇮🇷 ١. تا؛ حـرف شـرط ٢. تا؛ حرف فاصلەی زمانی یا مکانی ٣. تا؛ برای اینکه ٤. تا؛ سپس ٥. تا جایی کە ٦. از؛ حرف قیاس

**تا**[4]: پێشوشە. تاکە؛ تاقەدانەیەک ‹تاقرانی؛ تـاکراس› 🇮🇷 تک ـ

**تابار / tabar**/: ناو. جەم؛ لابار 🇮🇷 لنگەبار

**تابـان / taban**/: ناوەڵناو. ١. تیشـکدەر؛ گرشـەدار؛ بە درەوشین ‹ئاسمانی حوسنی مەحبووبم لە ئـەبرۆ و زولـف و ڕوو/ دوو هـیلال و دوو شـەو و دوو مـاهی تابانـی هەیە «نالی»› ٢. هەڵهاتوو؛ دەرهاتوو 🇮🇷 ١. درخشان؛ تابان ٢. بردمیده

**تابـدار / tabdar**/: ناوەڵـناو. لـوور؛ پـێچدراو 🇮🇷 پیچ‌خورده

**تابر / tabiř**/: ناو. ١. *[باوەڕی کۆن]* دۆعـای لـەرز و یاو کە بە سـەر ڕیسـمانێکدا دەخوێنـدرێت و لـە مەچەک دەبەسترێت ٢. لۆبر؛ چۆنیەتی پچـڕانی تالی تەون 🇮🇷 ١. دعـای تـب‌بُـر ٢. حالـت گسسـتن رشته‌ای از نخ قالی

**تابشت / tabişt**/: بـڕ؛ بڕسـت؛ تاقـەت؛ توانـایی؛ توانست 🇮🇷 توانایی

**تابگە / tabge**/: نـاو. جێگەی لەنگر گرتنی گـەمی و بەلەم و کەڵەک 🇮🇷 لنگرگاه

**تابلۆ**[1] **/ tablo**/: ☜ **تابلۆ**

**تـابلۆ**[2]: ناوەڵـناو. زەق و سـەرنجڕاکـێش 🇮🇷 تـابلو؛ آشکار

**تابلەمە / tableme**/: ☜ **تاولەمە**

**تابڵمە / tabiłme**/: ☜ **تاولەمە**

**تـابڵۆ / tabło**/: نـاو. تـابلۆ؛ تاپلـۆ: ١. پەڕەیـەک (کانزایی، شووشەیی، پلاستیکی و...) کە نووسـراوە، وێنە یان هەردووکیانی لە سەرە و بـۆ ڕاگەیانـدن لە شوێنێکی گشتیدا هەڵیدەواسن ٢. پـەڕە یـان قاپێ کە لە سەر دیـوار یـان پایـەوە دادەمـەزرێ تاکوو ئەو شتانەی لە سەریە لە بەر چـاو یـان لـە بەر دەستدا بن ‹تابڵۆی کارەبا› 🇮🇷 ١و٢. تابلو

**تابوت / tabût**/: نـاو. تاوت؛ تاویت؛ تابیت؛ تـاوس؛ تاقـێر؛ لـەزاگ؛ وەخـم؛ چـاردارە؛ سـوندروک؛ سـوندریک؛ سـندووریک؛ دارەمـەیت؛ دارەبـازە؛ داربازە؛ دوودارە؛ داربـەس؛ داربەسـت؛ دارەتـەرم؛ تەختی مردوو گواستنەوە ‹بۆیـە پـێم خۆشـە کـە تابووتـم لە بەرزی دابنێن/ تا نەسیم و بـای شەماڵـی کوردسان بیگرێتەوە «قانع»› 🇮🇷 تابوت

**تابور / tabûr**/: ناو. تابوورە؛ تابوون؛ هەنگ؛ فەوج؛ دەستەیەکی هەزار کەسی لەشکر ‹تـابووری مـوژە دەس بـە سـنان بـۆ مـنی بێکـەس/ ئامادەیـە وەک عەسـکەری خوێنـڕێژی تـەتارم «شـاهۆ»› 🇮🇷 هنـگ لشکر

**تابورە / tabûre**/: نـاو. ١. ☜ **تابـور** ٢. قـانوون؛ یاسا 🇮🇷 ١. ☜ **تابور** ٢. قانون

**تابوق / tabûq**/: ناو. خشت؛ کەرپووچ 🇮🇷 خشت

**تابـون / tabûn**/: نـاو. *[مەجاز]* ١. دار و دەسـتە ٢. خزمـەتکار؛ دەسـت و پێوەنـد 🇮🇷 ١. دارودسـته ٢. وَردست و خدمتکار

**تابە / tabe**/: ☜ **تاوە**

**تابـەرە / tabere**/: نـاو. تـات؛ تاتریـک؛ تاتەبـەرد؛ تاتەشوار؛ تاتەشۆر؛ سواپ؛ بەردی تەنک و پان کە بە سەر ئاویدا دەهاوێن 🇮🇷 سنگ پهن و نازک که بر روی آب پرتاب کنند

**تابـەن / taben**/: نـاو. شـیرازە؛ شلاڵـە؛ بـڕۆش؛ شیراز: ١. شیرازەچن؛ دروومانی لاپەڕەی کتێب یـان دەفتـەر ٢. ئـەو بەنانـەی لاپـەڕەی کتێـب پێکەوە دەبەستێ 🇮🇷 ١و٢. شیرازه

**تابـەنی / tabenî**/: نـاو. شـیرازەچنی؛ کـاری بـنچنـینی کتێـب و دەفتـەر 🇮🇷 شـیرازەبنـدی؛ تەبندی

**تابیت / tabît/:** ☜ **تابوت**

**تابیلا / tabîla/:** ناو. کاری دووپاتە کردنەوەی داخواز ☰ تکرار تقاضا

**تابین / tabîn/:** ناو. لەشکرچی بێدەرەجە ☰ سربازی که درجه ندارد

**تابیە / tab(i)ye/:** ناو. تاپی؛ سەنگەر؛ مەتەرێز ☰ سنگر

**تابێتی / tabêtî/:** ☜ **تایبەت**

**تاپ / tap/:** ناو. پەرکەم؛ خووڕ؛ فێ ☰ صرع

**تاپاز / tapaz/:** ناوەڵناو. زەبەلاح؛ زلحۆرت؛ ئەستوور ☰ گُندەبک

**تاپاڵ / tapał/:** ناو. هەڕەشە؛ گەف ☰ تهدید

⊡ **تاپاڵ دان:** دانه بەر؛ بە گوڕ و تێکڕا لێخوڕین ‹گا و گوێلەکەم تاپاڵ دان، کردمنە ناو پەچەکەوە› ☰ گروهی راندن

**تاپان[1] / tapan/:** چاوگ. پێچانەوە؛ لوول دان ☰ بربستن

**تاپان[2]:** ناو. سمە وشتر ☰ پای شتر

**تاپڕ / tapiř/:** ناو. تفەنگی ڕاو کە لە بن لوولەکەیەوە فیشەکی تێ دەخرێت ☰ تفنگ شکاری تەپُر

**تاپلۆ / tapło/:** ☜ **تابلۆ**

**تاپۆ / tapo/:** ناو. ١. تارمایی؛ ڕەشایی لە دوورەوە ‹لە ئەندامی تاپۆی وەکوو بوومەلێلی ... «سوارە»› ٢. مووچە و مەزرای خەلاتی و بێباج ٣. قۆچان؛ کەوال؛ قەبالە؛ قەوالە؛ قەبارە؛ بنچاخ؛ چاخ؛ قەبالەی مولکایەتی؛ بەلگەیێ کە خاوەن بوونی کەسێک بە سەر ماڵێکدا پیشان دەدا ‹هەموو ملکی بەلا و میحنەت بە تەنیا ملک و تاپۆمە/ کەسێ وا بێ لە ناو شارا چ دەربەستی سەرابێکە؟ «قانع»› ٤. کارگێڕیی قەبالەی مولکنووسین ☰ ١. شَبَح ٢. تیول ٣. سند مالکیت ۴. ادارەی ثبت املاک

**تاپوو / tapû/:** ناو. کەوار؛ کان؛ کارتیان؛ کەندووی ئارد و دانەوێڵە ☰ کندوی غله

**تاپەڵە / tapełe/:** ناو. ڕەشەگرانە؛ گرانەتا ☰ تیفوس

**تاپی / tapî/:** ناو. ١. خەندەک؛ ڕەهەند ٢. تابیە؛ سەنگەر ٣. ئەلحەو؛ لەهەک؛ گۆڕیچە ☰ ١. خندق ٢. سنگر ٣. لَحد

**تات[1] / tat/:** ناو. ١. عەرەب؛ عارەب؛ عەرەو ٢. شاخی هەڵەمووت و یەکپارچە بەرد ٣. ☜ **تابەرە** ٤. لباد؛ نمەد؛ نەوو؛ کولاڤ ٥. باب؛ باوک ٦. ڕاستایی؛ تەختانی ☰ ١. عرب ٢. کوه صخرەای ٣. ☜ **تابەرە** ۴. نمد ۵. پدر ۶. هموارى

**تات[2]:** ناوەڵناو. ١. تۆک؛ نەزۆک بە هۆی ئێسکی بەر منالدان ٢. سەخت؛ ڕژد؛ یەکپارچە و تۆکمە ‹بەردەتات› ☰ ١. ویژگی زن نازایی کە استخوان مجرای رحمش را گرفته ٢. سخت

**تا ـ تا[1] / ta ta/:** ناوەڵناو. تاڵە ـ تاڵە وەستاو ‹لە سەر بەفرێ بە کار نایە، وەکوو بیستوومە، داوی ڕەش/ لە سەر کولمەت ئەدی بۆ دلگرە ئەو بسکە تا ـ تایە؟! «هێمن»› ☰ شلال

**تا ـ تا[2]:** ناوەڵکار. دانە ـ دانە؛ یەکە ـ یەکە ‹بە شکنجی زولف خۆش قوماشەوە/ تا ـ تا پەخشانە بە ڕووی تاشەوە «پیرەمێرد»› ☰ یکی ـ یکی

**تاتاڵە / tatałe/:** ناو. تاج کۆڵەکە؛ سەرکۆڵەکە ☰ سرستون

**تاتریک / tat(i)rîk/:** ☜ **تابەرە**

**تاتک / tatik/:** ناو. ١. دادە؛ خوشکی گەورە؛ خۆها مەزن ٢. مام؛ ئاپ؛ برای باب ٣. تات؛ عەرەب؛ عارەو ٤. زمانی عەرەبی ☰ ١. خواهر بزرگ ٢. عمو ٣. عرب ۴. زبان عربی

**تاتکی / tatkî/:** ناو. قاپووت؛ فەرەنجی ☰ نوعی بالاپوش نمدین

**تاتۆ / tato/:** ناو. ١. باوک؛ باڤ؛ بابۆ ٢. تەتۆ؛ کار و

ڕەوتی خاڵ کوتان بە زەبری ڕەنگڕێژ کردنی ژێر پێست کە زیاتر نەخش و نیگاری پێدەردێنن 🇮🇷 ۱. پدر ۲. تاتو

**تاتۆڵە / tatołe/**: ناو. تاتوولە؛ داتوورە؛ گیاگۆپاڵ؛ گیایەکە بەرەکەی لە هێلکە ڕیشۆڵی دەکا، دەسووتێنرێت، دووکەڵەکەی هوورک کوژە 🇮🇷 گیاه تاتوره

**تاتوولە / tatûle/**: ☜ **تاتۆڵە**

**تاتە / tate/**: ناو. ۱. دادە؛ تاتک؛ خوشکی گەورە ۲. پیرەنۆکەر ۳. مام؛ مامۆ؛ مامە ٤. مێردی تایەن ٥. باوک؛ باب 🇮🇷 ۱. خواهر بزرگ ۲. پیرنوکر ۳. عمو ۴. پدرخوانده ۵. پدر

**تاتەبەرد / tateberd/**: ☜ **تابەرە**

**تاتەزا / tateza/**: ناو. ئامۆزا؛ فرزەندی مام؛ بچووکی ئاپۆ 🇮🇷 عموزاده

**تاتەشوار / tateş(i)war/**: ☜ **تابەرە**

**تاتەشۆر / tateşor/**: ☜ **تابەرە**

**تاتەنوێژ / taten(i)wêj/**: ناو. بەردەنوێژ؛ کوچکنوێژ؛ بەردی پانی نوێژ لە سەر کردن 🇮🇷 سنگ تخت و پهن ویژەی نماز خواندن

**تاتی / tatî/**: ناو. ۱. تاتە؛ باوەپیارە؛ مێردی تایەن ۲. باوەژن؛ ژنی باوک ۳. لباد؛ نمەد؛ نەوو؛ تەحت ٤. دۆخی نەزۆکی لە بەر ئێسکی بەر منالدان ٥. سەروژێری پیتی نووسراو 🇮🇷 ۱. پدرخوانده؛ شوهرِ مادر ۲. زن‌بابا ۳. نَمد ۴. نازایی بر اثر زائدەی استخوانی در مجرای رَحِم ۵. اِعرابِ حروف

**تاتیزۆک / tatîzok/**: ناو. گەردەلوول؛ گێژەڵووکە 🇮🇷 گردباد

**تاتیلە / tatîle/**: ناو. ژار؛ زەهر 🇮🇷 زهر

**تاتێل / tatêl/**: ناو. دڵەڕاوکێ؛ دڵ‌پەشێوی؛ دلخورتی؛ نیگەرانی 🇮🇷 اضطراب

**تاج / tac/**: ناو. تانج؛ تانجە؛ زەرزەنگ؛ تاژ؛ کولیلک: ۱. تەقیلەی سەر بە قوچکە ‹گوڵ تاجی لە سەر نا و چەمەن مەخمەلی پۆشی/ هات موژدە کە خەلعەت گەییە بەر بە موباهات «نالی»› ۲. کلاوی پاشایان ‹کام سەرشام تەمای تاج کەیت نەکەرد/ سوبحدەم وە تاج سەر نەیت نەکەرد؟ «مەولەوی»› 🇮🇷 ۱. کلاه مخروطی شکل ۲. تاج

▣ **تاجی سەر:** *[مەجاز]* بەڕێز؛ سەروەر؛ زۆر هێژا و خۆشەویست 🇮🇷 تاجِ سر؛ بسیار گرامی

**تاجخرووس / tacx(i)rûs/**: ناو. پۆپەکەڵەشێر؛ پۆپنەکەڕەشێلە؛ پۆپەکەڵەشێرە؛ تاجخورووز؛ تانج کەڵەشێر؛ تانجی؛ سۆلان؛ سواو؛ بادروو؛ باقلەک؛ سوارۆک: ۱. بنەگیایەکی یەکسالانی جوانە بە گەڵای هێلکەییەوە ۲. گوڵەمەخموور؛ گوڵ‌عاشقان؛ گوڵ‌بادروو؛ گوڵی ئەو ڕووەکە بە ڕەنگی سوور یان زەردەوە 🇮🇷 ۱. تاجخروس ۲. گل بُستان‌افروز

**تاجخورووز / tacxurûz/**: ☜ **تاجخرووس**

**تاجدار / tacdar/**: ناو. شا؛ پادشا ‹هەموو خوێنی شەهان و تاجدارانە لە بن خاکا/ کە وا هەوری بەهاری سەرزەمینی پێ دەکا گوڵ ـ گوڵ «مەحوی»› 🇮🇷 شاه

**تاجر / tacir/**: ناو. بازرگان؛ سەوداگەر؛ مامەڵەچی 🇮🇷 بازرگان؛ تاجر

**تاجکۆڵەکە / tackołeke/**: ناو. تاتالە؛ سەرکۆڵەکە 🇮🇷 سرستون

**تاجوتەخت / tac û text/**: ناو. تەختوتاج: ۱. *[کینایە]* نیشانەی پاشایەتی ‹ئەو کەی بی پەی تۆ جە شاهیش ویەرد/ تەرک تاجوتەخت پادشاهی کەرد «خانای قوبادی»› ۲. *[مەجاز]* دەسەلاتداری؛ پاشایی 🇮🇷 ۱و۲. تاج‌وتخت

**تاجەگوڵ / taceguł/**: ☜ **تاجەگوڵینە**

**تاجەگوڵینە / tacegułîne/**: ناو. تاجەگوڵ؛ تانجیک؛ بازنەیەک لە گەڵا و گوڵی ناسک و جوان کە بۆ ڕێز نان لە سەر گۆڕ یان بەردەمی پەیکەری کەسێک دایدەنێن ‹کە وەفدێ دەچێتە

شوێنێ/ بۆ سەر گۆڕی سەربازی ون/ تاجەگولینەیەک دینێ «پەشێو»› 🇮🇷 تاج گل

**تاجی** / tacî/: ☜ **تاژی**

**تاجیلۆکە** / tacîloke/: ☜ **تاژیلۆکە**

**تاجیمامئەحمـــەدە** / tacîmam'eĥmede/: ☜ **تاژیلۆکە**

**تاجیوەر** / tacîwer/: ناوەڵناو. *[ئەدەبی]* خاوەن تـاج؛ تاج لە سەر ‹بە نازەوە لێم هاتە دەنگ، مەکە و لاچۆ لێم کەوتە جەنگ/ ڕوانیم کە ئەو گۆڕا لە ڕەنگ، وەک پادیشاهی تاجیوەر «قانع»› 🇮🇷 تاجور

**تاچک** / taçik/: ناو. تاپۆ؛ بنچاخ؛ قەواڵـە؛ بەڵـگەی خاوەنداریەتی نافەرمی 🇮🇷 بُنچاق

**تاچنـای** / taçnay/: چاوگ. وەرڤـین؛ دەلانـدن 🇮🇷 نشت دادن

**تاچە** / taçe/: ناو. جەواڵی پچووک 🇮🇷 تایچە

**تاچەک** / taçek/: نـاو. بـن‌چـەک؛ ئـەو بەشـە لـە دەستەچەک کە دەمێنێتەوە 🇮🇷 تەچک

**تاچیـای** / taçyay/: چـاوگ. دزە کـردن؛ دەلان 🇮🇷 نشت کردن

**تاحین** / taĥîn/: ☜ **تاعین**

**تاخ** / tax/: ناو. ۱. گەڕەک؛ مەحەلە ‹مالێ شـەمۆ ل تاخا ژوورە› ۲. لا؛ تەرەف ۳. خیاوان؛ شەقام 🇮🇷 ۱. محلّه ۲. طرف؛ سو ۳. خیابان

**تاخت** / taxt/: ناو. خار؛ چوارە 🇮🇷 چهارنعل

**تـاخم** / taxm/: نـاو. دەسـت؛ دەس؛ یەکـەی ژماردنی بڕێ شت (وەک: جل‌وبەرگ، قاپ، پەلەوەر و ...) 🇮🇷 دست؛ از واحدهای شمارش

**تـاخورک** / taxurk/: نـاو. تـاخۆک؛ زاگ؛ کاشـە؛ پێگۆزی بێ‌چەرخی سەر بەفر کە بـە خلیسـکان دەڕوا 🇮🇷 سورتمه

**تاخۆک** / taxok/: ☜ **تاخورک**

**تاخە** / taxe/: ناو. ۱. باقە؛ بەسـتراوێ لـە گیـا ۲. پاکەت 🇮🇷 ۱. یک بستەی گیاه ۲. پاکت

**تاخەبەند** / taxebend/: نـاو. باقـەبێن؛ باغەبـەن؛ باقەوەس 🇮🇷 بستەای کە گیاه را در آن بندند

**تـادار** / tadar/: ناوەڵناو. نۆبـەتی‌دار؛ یـاوکردگ 🇮🇷 تبدار

**تادانە** / tadane/: ناو. تانـە؛ نیشـانە؛ لەکـەی بـان چاو 🇮🇷 لکەی چشم

**تار**[۱] / tar/: نـاو. ۱. سازێکی ژێداری ئێرانی، شەش تالی هەیە و بە زەخمە دەیژەنن ‹های موغەنی تار حەنجەرەی وەش‌تەرز/ وە سەرپەنجەی ناز بـاوەرە وە لەرز «مەولەوی»› ۲. ڕاهێڵی تەون ‹هۆنەرێکی زۆر زەبەردەستە ئیمامی نۆکەرت/ بۆیە ڕیسی ڕێک‌وپێکە، قەت نەبوو بـێ تـار و پـۆ «شـاوات»› ۳. تاڵـەموو ٤. کەللە دەفە ٥. دوو ڕۆژی ئاخری زسـتان و سـێ ڕۆژی سەرەتای بەهار 🇮🇷 ۱. سازِ تار ۲. تارِ نخ ۳. تارِ مو ۴. چنبرەی دف ۵. دو روز آخر زمسـتان و سـه روز آغاز بهار

**تار**[۲]: ناوەڵـناو. ۱. تاریـک؛ بێبـەش لـە ڕۆشـنایی ‹تەماشای گلکۆی تارم‌کەر دولبەر!/ دوودی سـیای تـار، لـێش مـەیۆ وە بـەر «سـەیدی»› ۲. تـەرە؛ هەڵوەدا و دوورکەوتە ‹کوردستانی ئەو سـەردەمە وا تار بوو/ بەفری زستان گوڵی باغچـەی بـەهار بـوو «گـۆران»› ۳. ڕێ‌گـوم‌کـردە و جیـاوەبوو لـە ئەوانی‌تر ‹قانع! بەسـە ئـەم شـینە، بـە تـەنیا و بـە بێکەس/ خۆ کردە، نە خواکردە، کە هـەر کـوردە لـە تارا «قانع»› ٤. بێ بریقـە؛ مـات ‹ئاسمـانیش لـە شەفەق گریەیی خوێنینی ڕشت/ هێند بەسەر ڕۆژی ڕەشمدا کـە شـەوی تـار گریـا «پیرەمێـرد»› 🇮🇷 ۱. تاریک ۲. آوارە ۳. رمیدە ۴. مات

⊡ **تار بوون**: تەرە بوون؛ هەتلە بوون؛ جیاوە بـوون و ڕێ ون کردنی ئاژەڵ لە مێگەل ‹بـەرخێکمان تار بوو، هەیهوو تا گرتمانەوە› 🇮🇷 رمیدن

**تار کردن/ کرن**: ڕەواندن؛ دەرکردنی یـەکجاری؛ لە جێ ئاوارە کردن ‹بە درێژایی مێژوو، هەر خێل

و هۆزی کـوردن کـه لـه ولاتیـان تـار کـراون› 🇮🇷 کوچاندن

**تارا** / tara/: نـاو. سەرپۆشی سەری بـووک ‹دزەی نیگای ژێر تارای شەرم و ناز/ سەرنجی کێشام کیـژی کرچوکاڵ «سوارە»› 🇮🇷 سرپوش عروس

**تاراج** / tarac/: ☜ **تالان**

**تاراز** / taraz/: ناو. لۆمە؛ سەرکۆنە 🇮🇷 سرزنش

**تاران** / taran/: چـاوگ. تاریـان؛ تـەرە بـوون؛ ڕۆیشتنی بێگەڕانەوە 🇮🇷 رمیدن

**تاراندن** / tarandin/: چاوگ. تارانن؛ تەرە کـردن؛ ڕەواندن 🇮🇷 رماندن

**تارانن** / taranin/: ☜ **تاراندن**

**تارانی** / taranî/: نـاو. دوو قـرانی زێـو؛ جـۆرێ سکەی کۆنی ئێرانی 🇮🇷 دوریالی نقرەای

**تاراو** / taraw/: ئاوەڵنـاو. تاریـاگ؛ تـەرەکراو؛ دەرکراو؛ ڕاونراوی بێگەڕانەوە 🇮🇷 رمیده

**تاراوگە** / tarawge/: نـاو. شـوێنی تـارێنران ‹لـە تاریکە تاراوگەکەمـدا، بەسـەرچوو زەمـانی تـەریکیم/ ئیتر خێر و خۆشی لە ڕێما «سوارە»› 🇮🇷 تبعیدگاه

**تارپ** / tarp/: ناو. دیاری؛ سەوقات 🇮🇷 سوغات

**تارتارێن** / tartarên/: نـاو. غارغارێن؛ گرێوە غار 🇮🇷 مسابقەی دو

**تارچی**[1] / tarçî/: ☜ **تارژەن**

**تارچی**[2]: ئاوەڵناو. دابەش‌کەر 🇮🇷 توزیع‌کننده

**تارژەن** / tarjen/: نـاو. تارچی؛ سازی تار لێـدەر 🇮🇷 نوازندەی تار

**تارسە** / tarse/: نـاو. تاسـە؛ ئـارەزووی دیـدار 🇮🇷 اشتیاق دیدار

**تارشە** / tarşe/: نـاو. نامەبەر؛ چەپـەر؛ پۆسـتەچی؛ تەتەر 🇮🇷 پُستچی

**تارگان** / targan/: نـاو. چەشنێ گەنمی خـراپ 🇮🇷 نوعی گندم نامرغوب

**تارم** / tarim/: ناو. ١. خۆیـانی گێرەکـراوی بـەربا نەدراو ٢. هەیوان؛ بەربێلایی ٣. دەستە؛ تـاقم ٤. چادر و دیوەخانی چادر 🇮🇷 ١. غلەی کوبیدەی پاک نشده ٢. تراس ٣. دته؛ گروه ٤. خرگاه خیمه

**تارمایی** / tarmayî/: ناو. ١. تاپۆ؛ قەرە؛ قـەرەنتوو؛ تراوکە؛ دۆڵپا؛ تیبا؛ سـای؛ سـیار؛ سـایڵ؛ سـاوڵ؛ ساوڵە؛ ساوڕ؛ ئارنگ؛ بزگـوڕ؛ سـامۆتک؛ سـوێس؛ قەراتە؛ سەهوێر؛ سەهەنە؛ سـەهەنگ؛ سـەهەندە؛ شتی خەیاڵی کە دێتـە بـەر چـاو ‹نارەومـەوە لـە داوەڵ و تارمـایی/ زۆرم دیـوە بـوولێڵ و تاریکـایی «هێمن»› ٢. *[مەجاز]* دێوەزمـە؛ ئـەو شـتەی کـە دەبێتە هۆی ترس و قـینی هەمیشـەیی ‹دێـن و دەچـن بـە ئەسـپایی/ لـە چـوارچرا چەنـد تارمـایی «هێمن»› 🇮🇷 ١و٢. شبح

**تارمە** / tarme/: ناو. ١. هـەیوانی سەردانەپۆشـراو ٢. محەجەری بەرهێوان 🇮🇷 ١. تراس ٢. تارم

**تارنای** / tarnay/: چـاوگ. تارانـدن؛ ڕەوانـدن ‹وە زۆر هونەر جە عەرسەی مەساف/ تارنـا دێـوان تـا بـە کـۆهی قـاف «شـاهنامەی کـوردی، هـەورامی»› 🇮🇷 رماندن

**تارومار** / tar û mar/: ئاوەڵناو. تەفروتوونا؛ هەڵاداد 🇮🇷 تارومار

**تارەت** / taret/: نـاو. کـاری خـۆ شـۆردن لـە ئاودەسـت. هـەروەها: **تارەت گـرتن** 🇮🇷 طهـارت؛ استنجا

**تاری** / tarî/: نـاو. تـاریکی؛ ڕەشـی ‹لـە داخـی بێکەسی ئەم خاکە دایم ڕۆژی شەبڕەنگـە/ مەگـەر بەرقی غەزەب ئەم تاری بەرچاوەم تەوەڵلا کا «قانع»› 🇮🇷 تاریکی

**تاریاگ** / taryag/: ☜ **تاراو**

**تاریان** / taryan/: ☜ **تاران**

**تاریای** / tar(i)yay/: چاوگ. تاران؛ تاریان ‹ئاهووی خوتەن خێز دیدەی پڕ خەتا/ تاریـای ڕەوێـل نافـەی موشک مەتا «بێسارانی»› 🇮🇷 رمیدن

**تــاریتی / tarîtî**/: نـاو. تـاریکی؛ ڕەشـایی شـەو 🇮🇷 تاریکی

**تــاریخ / tarîx**/: نـاو. مێـژوو؛ دێریـک؛ دیـرۆک؛ دێـرک؛ لقێـک لـە زانسـتە مرۆڤـییەکان کـە دەپەرژێتـە سـەر تۆمـار کـردن و لێکدانـەوەی ڕابردوو و ڕابردووان 🇮🇷 تاریخ

**تاریف / tarîf**/: ناو. ١. پەسن؛ سـتایش ٢. کـاری باس کردن؛ گێڕانەوە 🇮🇷 ١. ستایش ٢. تعریف

⊡ **تـاریف دان**: تاریف دانەوە؛ تاریف کردن؛ پەسن دان؛ پێدا هەڵگوتن 🇮🇷 تمجید کردن

**تاریف دانەوە**: ☜ **تاریف دان**

**تاریف کردن**: ١. ☜ **تـاریف دان** ٢. گێڕانـەوە؛ بـاس کـردن 🇮🇷 ١. ☜ **تـاریف دان** ٢. تعریـف کردن

**تاریک / tarîk**/: ناوەڵناو. تار؛ پێوار لە ڕووناکـایی 🇮🇷 تاریک

⊡ **تاریـک بـوون**: ڕەش هەڵــگەڕانی دنیـــا دوای خۆرئاوا بوون 🇮🇷 تاریک شدن

**تاریک داهـاتن**: هـاتنی تـاریکی پـاش نـوێژی شێوانی درەنگ 🇮🇷 تاریک شدن (هوا)

**تاریک کردن**: تاریـک داهـاتن ‹تـاریکی کـرد بـا بچینەوە بۆ ماڵ› 🇮🇷 تاریک کردن (هوا)

**تاریکـان**[1] **/ tarîkan**/: ناو. تاریکـەی: ١. ئـەنگۆرە؛ هــەنگۆرە؛ هەنگڤــار؛ تــەنگی ئێــوارە؛ وێرەگــا؛ ڕۆژپەڕ؛ درەنگان؛ ئێوارەی درەنگ ٢. چراکەران؛ بانگاف؛ شێوانگا؛ شـێوان؛ لـە سـەرەتای تاریـک بـوونی هـەوا تـا کاتژمێرێـک دواتـر 🇮🇷 ١. تنـگ غروب ٢. شامگاه

**تاریکـان**[2]: ناوەڵکار. لـە سـەرەتای شـەودا؛ کـاتی شێوان؛ درەنگانێ 🇮🇷 هنگام غروب

**تاریکـایی / tarîkayî**/: نـاو. ڕەشـایی شـەو؛ پـاش بەرپێوار بوونی خۆر 🇮🇷 تاریکی شب

**تاریکخانــە / tarîkxane**/: نـاو. تاریکەخانـــە: ١. دیوی تایبـەت بـۆ شـۆردنەوە و ڕوون‌کردنـەوەی فیلم کە لە تیشـکی زیانبـار پـارێزراوە ٢. */مەجاز/* شوێنی دوور لە چاوی خەڵـک بـۆ بـەڕێوەبردنی پیلان 🇮🇷 ١. تاریکخانە ٢. مخفیگاه

**تاریکنایـەرە / tarîknayere**/: چـاوگ. تـــاریکی داهێنان؛ تاریک کردن 🇮🇷 تاریک کردن (هوا)

**تاریک و تنۆک / tarîk û t(i)nok**/: ناوەڵناو. تاریک و تنووک؛ زۆر تاریک؛ ئەنگوستەچاو؛ بـە تـاریکی خەست و توند 🇮🇷 بسیار تاریک

**تاریک و تنـوک / tarîk û t(i)nûk**/: ☜ **تاریك و تنۆك**

**تاریک و ڕوون / tarîk û řûn**/: ناو. تاریـک‌ولـێڵ؛ تاریک‌وڕوونە؛ تاریک‌وڕوونی؛ بەرەبەیان؛ بوولێڵـە؛ هەوەڵی سپێدە 🇮🇷 تاریک و روشن صبح

**تاریک و ڕوونە / tarîk û řûne**/: ☜ **تاریك‌وڕوون**

**تاریک و ڕوونی / tarîk û řûnî**/: ☜ **تاریك‌وڕوون**

**تاریک و لێڵ / tarîk û lêł**/: ☜ **تاریك‌وڕوون**

**تاریک و نوتـەک / tarîk û nûtek**/: ناوەڵـناو. زۆر تاریک؛ ئەنگوستەچاو؛ تاریکایی خەست و توند 🇮🇷 بسیار تیره و تاره

**تاریکە / -tarîke**/: پێشوشە. ڕەش و تار ‹تاریکەشەو› 🇮🇷 تیره و تار

**تاریکـەبازاڕ / tarîkebazař**/: نـــاو. بازاڕچـــــە؛ بوارگـەیێکی زۆرتـر سەرداپۆشـراو، بـە چەنـد دووکانی هەمەجۆرەوە 🇮🇷 بازارچە

**تاریکەخانە / tarîkexane**/: ☜ **تاریکخانە**

**تاریکـەسـەلات / tarîkeselat**/: نـاو. زۆر تاریـــک؛ تاریکایی خەست 🇮🇷 تاریکی محض

**تاریکەشەو / tarîkeşew**/: ناو. بلقەتاف؛ تلیچاف 🇮🇷 شب تاریک

**تاریکەی / tarîkey**/: ☜ **تاریکان**[1]

**تـاریکی / tarîkî**/: نـاو. ڕەشـایی ‹تـاریکی تـەمی دەشتی دڵ و تانەیی سەرچاو/ شابالی پەخش کردبوو

تاکوو ئەبەدییەت... «گۆران»» ☰ تاریکی

**تاریکیایەرە** / tarîkyayere/: چاوگ. تاریک بوون؛ تاریکی داهاتن ☰ تاریک شدن

**تارێتی** / tarêtî/: ناو. قەر؛ تاریکی؛ تاریکایی ☰ تاریکی

• **تارێن** / tarên-/: پاشەوشە. هۆی تاراندن ‹... بە گەرووی قاسپەکەری کەوتارێن/ جاڕی کام گومبوو ئەدەن؟ / وا بە هەڵپە و بە دەهۆ «سوارە»» ☰ فراریدهندە

**تارێنران** / tarênran/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //تارێنرای؛ دەتارێنرێی؛ بتارێنرێ// تاریان؛ ناچار کرانە هەڵاتن ☰ فراری دادە شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: تارێنراو/ چاوگی نەرێنی: نەتارێنران

**تارێنراو** / tarênraw/: ئاوەڵناو. دوورەوەخراو؛ تاریاگ ☰ فراری دادە شدە

**تاڕ** / taȓ/: ناو. شەلەم؛ شێلم ☰ شلغم

**تازانک** / tazanik/: ☜ تاژانك

**تازە**[1] / taze/: ناو. نوێ؛ نەو؛ نۆ؛ نوو؛ قەیتازە؛ نرکنوو؛ شتی تازە ‹تازە هاتۆتە بازاڕێ، کۆنە کەوتۆتە کەنارێ «مەسەل»› ☰ تازە

**تازە**[2]: ئاوەڵناو. نوێ: ١. نۆ؛ نەو؛ نفت؛ نووف؛ ناقۆ؛ نفتونۆل؛ نەوەیی؛ سەرهەڵداو لە ڕابردوویەکی نزیکدا ‹فەسڵی نەو پایز تازە کەردەن مەیل/ شەماڵ ئەرزان کەرد ڕەشتەی نەوسوەیل «مەولەوی»› ٢. نۆ؛ نەو؛ نفت؛ نووف؛ ناقۆ؛ نەوەیی؛ بێهاوتا لە ڕابردوودا ‹قسەی تازە› ٣. گوڵبەدەم؛ تەڕ؛ پەژ؛ تەرچک؛ تەرجگ؛ خاوەن سەرسەوزی ‹میوەی تازە› ☰ ١تا٣. تازە

⊡ **تازە بوونەوە** نوێ بوونەوە ☰ نو شدن

**تازە کردنەوە** نوێ کردنەوە؛ نۆ کرنەڤە ☰ نو کردن

**تازە**[3]: ئاوەڵکار. ١. تۆزێک پێش لەم کارە ‹تازە ئەبرۆت وسمە کێشاوە بە ناز/ دڵ لەتی شمشێری تازەساوم ئەز «نالی»› ٢. ئەوسا؛ ئەوساکە؛ ئەوسایچ؛ ئەو سەرەکەی؛ ئەو سەرەکەیچ؛ ئەو سەرەکانی؛ جا؛ جاخۆ ‹ئازاد گوتوویەتی دێم، تازە، ئەگەریش نەهات هەر خۆم دەڕۆم› ٣. ئێستا؛ هێشتا؛ هێما؛ هەڵای ‹شووشەکەی شکاندووە، تازە چەنەیش ئەدات!› ٤. ئیدی؛ ئیتر ‹بە ڕیشی بۆزەوە سوجدەی دەبەم من بۆ جەماڵی تۆ/ ئەدی بۆچی دەیانگوت دار کە پیر بوو تازە دانایە «هێمن»» ☰ ١. تازە ٢. آنوقت ٣. بە علاوە

**تازە**[4]: پێشوشە. ١. خاوەن تازەیی ‹تازەزاو؛ تازەدەم› ٢. نوێ ‹تازەکار؛ تازەجەوان› ☰ ١و ٢. تازە ـ نو ـ

**تازەئیجاد** / taze'îcad/: ئاوەڵناو. تازەداهاتوو؛ تازەدروستکراو ☰ نوساخت

**تازەبابەت** / tazebabet/: ☜ تازەداهاتو

**تازەباو** / tazebaw/: ئاوەڵناو. نوێداهاتوو؛ بابەتی ڕۆژ ☰ تازە بە بازار آمدە

**تازەبرین** / tazeb(i)rîn/: ئاوەڵناو. [مەجاز] تازە تووشی بەڵا هاتوو ☰ تازە مصیبتدیدە

**تازەبووک** / tazebûk/: ناو. نۆبووک؛ نووبیویک؛ تازەوەوی؛ بوویکانوو؛ کچێ کە تازە بۆتە بووک ‹خۆ ئێستا ڕیش و سمێڵ مەترووکە/ هەرچی ئەبینی وەک تازەبووکە! «پیرەمێرد»» ☰ نوعروس

**تازەبەتازە** / tazebetaze/: ئاوەڵکار. تازەتازە؛ تۆزێ پێش ئێستا ‹نالیا ئەم غەزەلەت تازەبەتازە وتووە/ بە دووسەد مەسنەوی و لوبیی لوبابی نادەم «نالی»» ☰ تازەبەتازە

**تازەبەر** / tazeber/: ئاوەڵناو. نۆبەرە؛ تەروەندە؛ تازەپێگەییو ☰ نوبر

**تازەبەهار** / tazebehar/: ☜ نۆبەهار

**تازەپیاکەفتگ** / tazep(i)yakeftig/: ☜ تازەپێداکەوتو

**تازەپیاکەوتو** / tazep(i)yakewtû/: ☜

تازەپێداکەوتوو

**تازەپیر** / tazepîr/: ناو. پادسن؛ گەڕاوە؛ لە سەرەتای سەردەمی پیریدا ≡ نوپیر

**تازەپێداکەوتوو** / tazepêdakewtû/: ئاوەڵناو. [پەلار] تازەپیاکەفتگ؛ تازەپیاکەوتوو؛ دەوڵەمەن چڵکن؛ تازەکیسە؛ نۆکیسە؛ تازە دەوڵەمەند بووی بەرچاوتەنگ ≡ نوکیسه

**تازەپێگەیشتوو** / tazepêgeyiştû/: ئاوەڵناو. تازەپێگەییو ≡ نورَس

**تازەپێگەییو** / tazepêgeyîw/: ☜ **تازەپێگەیشتوو**

**تازەتازە** / tazetaze/: ☜ **تازەبەتازە**

**تازەجوان** / tazec(i)wan/: ☜ **تازەلاو**

**تازەجەوان** / tazecewan/: ☜ **تازەلاو**

**تازەداهاتگ** / tazedahatig/: ☜ **تازەداهاتوو**

**تازەداهاتوو** / tazedahatû/: ئاوەڵناو. تازەداهاتگ؛ تازەبابەت ≡ تازه مُدشده

**تازەدەم** / tazedem/: ئاوەڵناو. تازە ئامادەبوو ≡ تازه آماده شده

**تازەزاگ** / tazezag/: ☜ **تازەزاو**

**تازەزاو** / tazezaw/: ئاوەڵناو. تازەزاگ؛ تازەزاییگ ‹نە بۆڕەبۆڕی مانگای تازەزاوە/ نە شلقەشلقی مەشکەی نیوەژاوە «هێمن»› ≡ تازەزاییده

**تازەزاوا** / tazezawa/: ناو. پیاوێ کە تازە زەماوەنی کردووە ≡ تازەداماد

**تازەزاییگ** / tazezayîg/: ☜ **تازەزاو**

**تازەساز** / tazesaz/: ئاوەڵناو. نۆساز؛ نوێساز؛ بە بیچم یان بینای تازەوە ‹خانووی تازەساز› ≡ نوساز

**تازەساو** / tazesaw/: ئاوەڵناو. تازەسوو؛ تایبەتمەندی تیغی تازە تیژکراو ‹تازە ئەبرۆت وسمە کێشاوە بە ناز/ دڵ لەتی شمشێری تازەساوم ئەز «نالی»› ≡ تازه تیز شده

**تازەسوو** / tazesû/: ☜ **تازەساو**

**تازەفەقێ** / tazefeqê/: ناو. سوختە؛ دەرس‌خوێنی سەرەتایی ≡ طلبه‌ی دوره‌ی مقدماتی

**تازەقڵا** / tazeq(i)ła/: ئاوەڵناو. ١. تازەکار؛ ناشی ٢. تازەداهاتوو ≡ ١. تازه‌کار ٢. تازه مُدشده

**تازەکار** / tazekar/: ئاوەڵناو. ناشی؛ نامامیەد؛ نۆمس؛ تازە خەریکی کارێک بوو ≡ تازه‌کار

**تازەکیسە** / tazekîse/: ☜ **تازەپێداکەوتوو**

**تازەگی** / tazegî/: ☜ **تازەیی**

**تازەلاو** / tazelaw/: ناو. تازەجەوان؛ تازەجوان؛ نۆجەوان؛ لاجک؛ لاوک؛ لاجەک؛ لاژەک؛ لاوژۆک؛ لاوژۆکە؛ نەوهاڵ؛ نۆگها؛ نۆچە؛ ڕەسی؛ نووهاڵ؛ لیکە؛ لیکلە؛ مێردمنداڵ: ١. لاوێژ؛ لاوێژە؛ کەسێ تازە سەردەمی منداڵیی ناوەتە پشتە سەر ‹بێچووە شێرانی چابک و بێباک/ تازەلاوانی میللی و خوێن‌پاک «هێمن»› ٢. کەسێ کە لە قۆناخی تازەلاویدایە ≡ ١و٢. نوجوان

**تازەلاوی** / tazelawî/: ناو. لاوکی؛ لاوێژی؛ نەوهاڵی؛ لاوێژەیی؛ نۆجوانی؛ نۆچەیی: ١. سەرەتای تافی لاوی ٢. ماوەی تەمەنی ١٣ تا ١٧ سالان لە مرۆدا ≡ ١و٢. نوجوانی

**تازەمێرد** / tazemêrd/: ☜ **زاوا**

**تازەنەفەس** / tazenefes/: ئاوەڵناو. خاوەن هێز و هەناسەی تەواو و بەبێ نیشانەی ماندوویی ≡ تازەنفس

**تازەونفتونۆڵ** / taze w nift û noł/: ☜ **تازەونوتونوێ**

**تازەونوتونوێ** / taze w nut û n(i)wê/: ئاوەڵناو. تازەونفتونۆڵ؛ زۆر تازەی هێشتا دەکار نەکراو ≡ تازه و کارنکرده

**تازەوەوی** / tazewewî/: ☜ **تازەبووک**

**تازەیی**[1] / tazeyî/: ئاوەڵناو. تازەگی؛ نوێیەتی؛ تەڕچکی؛ تەڕجگی؛ بارودۆخ و چۆنیەتی تازە بوون ‹تازەیی میوە و سەوزییەکان بەرچاو بوو› ≡ تازگی

**تـازەیی**[٢]: ئاوەڵکار. تازەگی؛ بە تازەیی؛ بەم تازەییە؛ بەم تازەییانە؛ نوهی؛ لە ڕابردووی نزیکدا ‹تـازەیی بووەتە سەرپەرشتی کارگا› 🇮🇷 تازگی

**تـازی** / tazî/: ئاوەڵـناو. ١. ☜ **تەزی ـ٢** ٢. ڕووت و قووت 🇮🇷 ١. ☜ **تەزی ـ٢** ٢. لُخت و عور

**تازیـاری** / tazyarî/: نـاو. سەرپشـکی؛ هەڤـیازی؛ دۆخی باشتر و لە پێشتر بوون 🇮🇷 امتیاز

**تازیانـە** / taz(i)yane/: نـاو. ١. قـامچی؛ شـەلاخ؛ شەللاق؛ جەلدە ٢. ☜ **تازیمانـە** 🇮🇷 ١. تازیانـە ٢. ☜ **تازیمانە**

**تازیلە** / tazîle/: ناو. وردەبڕوێش 🇮🇷 ریزە بلغور

**تازیمانە** / tazîmane/: ناو. تازیە؛ تازیانە؛ ئازیـەت؛ ئازیەتی؛ پرسە؛ سەرەخۆشی 🇮🇷 تعزیە

**تازیە** / taz(i)ye/: ناو. ١. ☜ **تازیمانە** ٢. گەنمی دەسـتـاڕکراو؛ گـەنمی نیمـەکوتراو 🇮🇷 ١. ☜ **تازیمانە** ٢. گندم نیمکوب

**تازیـەبار** / taz(i)yebar/: ئاوەڵـناو. ئازیـەتبار 🇮🇷 عزادار

**تازیەباری** / taz(i)yebarî/: ناو. ئازیەتباری؛ ماتـەم 🇮🇷 عزاداری

**تازیـەدار** / taz(i)yedar/: ئاوەڵـناو. ئازیـەتبار 🇮🇷 عزادار

**تازیەمانی** / taz(i)yemanî/: ناو. تازیە؛ تایبەت بـە پرسە ‹شیعری تازیەمانی› 🇮🇷 سوگواری

**تاژ** / taj/: ناو. ڕەشماڵ و دەواری بەرزی پەشمینە 🇮🇷 چادر بلند پشمی

**تاژان** / tajan/: ناو. ١. لقی زراو؛ لکـی بـاریکی دار ٢. قامچی؛ شەلاخ 🇮🇷 ١. جوانەی درخت ٢. تازیانە

**تاژانک** / tajanik/: نـاو. تازانک؛ قامچی؛ شەلاخ 🇮🇷 تازیانە

**تاژپلنگ** / tajp(i)łing/: نـاو. وەرشەق؛ وەرشـەک؛ تولەپلـنگ 🇮🇷 یوزپلنگ

**تاژللۆرە** / tajillore/: ناو. تاوێرەبەردی خلۆرەوەبوو لە بەرزاییەوە 🇮🇷 سنگ بزرگ غلتان

**تاژی** / tajî/: نـاو. تاجی؛ تـانجی؛ تانجیـە؛ تـانزی؛ سەگی ڕاو؛ تۆرەمەیـەک سـەگی ناوقـەد بـاریکی چابک بۆ ڕاو 🇮🇷 تازی؛ سگ شکاری

**تاژیئەحمەدڕاوکەرە** / tajî'eĥmedřawkere/: ☜ **تاژیلۆکە**

**تاژیلکە** / tajîlke/: ☜ **تاژیلۆکە**

**تاژیلۆک** / tajîlok/: ☜ **تاژیلۆکە**

**تاژیلۆکـە** / tajîloke/: نـاو. تاجیلۆکـە؛ تاژیلـە؛ تاژیلۆک؛ تاژیلکـە؛ تانجیلۆکـە؛ تـاژیی دۆریشـی؛ مەهینکا؛ ئەحمەدڕاوکەرە؛ تـاجی‌مـام‌ئەحمـەدە؛ ئەسپی ئەحمەدڕاوکـەرە؛ تـاژی‌ئەحمەدڕاوکـەرە؛ تانجی‌ماڵ‌خوای گیانە؛ تانجی‌قولانج؛ حوشترخوا؛ کوللەتانجیانـە؛ بـالووک؛ بالووکـە؛ بالبالووکـە؛ بالیک‌هورە؛ تانجی پێغەمبەرە؛ تـانجی‌پێغەمبـەر؛ ئەسپی پێغەمبەر؛ هەسپی نەبی؛ ئەسپی حەسەن حوسـێنان؛ کوللـەحاجی؛ کولـەحاجی؛ دۆریـش؛ دەوریـــش‌چووینـــە؛ دەوریشـــک؛ دەوریشـــە؛ دەرویش‌چووینە؛ دەوریش‌بالیک؛ کەرکێ‌فاتمـێ؛ دەورێش‌بالیک‌خوەر؛ جۆرێ کولـەی باریکەڵـەی زیت 🇮🇷 آخوندک

**تاژیلە** / tajîle/: ☜ **تاژیلۆکە**

**تاژیوان** / tajîwan/: نـاو. تانجیەوان؛ سەرپەرشـتی تانجیان 🇮🇷 پاسدار تازی

**تاس**[١] / tas/: نـاو. ١. قاپی قوولی مس ‹حاشـا خـۆ ڕەنگم هیچ نەماگە پێ/ سەرم وەکوو تاس دەنگی لێوە تـێ «مەولـەوی»› ٢. دەفـری گـەورەی تایبـەتی گەرماو ‹عاجز مەبە ـ نەک بۆ تۆ ـ وەفایـان نییـە بـۆ کەس/ مەعلوومە کە ئەم تاقمە وەک تاسی حـەمامن «شێخ ڕەزا»› ٣. بێزوو؛ مەگیرانی ٤. قاس؛ پێران؛ وناخ؛ نەخۆشییەکی گیرۆیە 🇮🇷 ١. آبگیـر مسـین ٢. تاس ٣. ویار ٤. خُناق؛ دیفتری

⊡ **تاس بردنەوە**: گێژ بوون ‹هەر چەند خەیاڵم وا بە

لاتـەوە/ بـەلام نـاوێرم بـێم بـە لاتـەوە/ چـون لـە جوانییەکەت تاس ئەمباتەوە «فولکلـۆر»» ≡ گـیج شدن

**تاس بە سەرا هاتن:** تووشی گێژی و سەرسامی بوون ≡ گیج و ویج شدن

**تاس کردن:** گێـژ و وڕ بـوون ‹ئـەو خەوەرمـە شنەفت، تاسم کرد› ≡ تاسیدن

**تاس**[۲]: ناوەڵناو. ۱. کـاس؛ گێـژ و ناتێگەیشـتوو ۲. هەوێز؛ حۆت؛ بێقژەسەر؛ تووکی سـەر وەریـو ≡ ۱. گیج و منگ ۲. تاس؛ بی مو

◘ **تاس بوون:** تووکی سەر وەرین ≡ تاس شدن

**تاس کردن:** گێژ کردن ≡ گیج کردن

**تاس‌ئەور / tas'ewr/:** ☜ **تینەگیا**

**تاسا / tasa/:** ناوەڵناو. بەتاسە؛ تامەزرۆ؛ ئاواتـەخواز؛ زۆر خوازیار ≡ آرزومند

**تاسان / tasan/:** چـاوگ. تاسـیان؛ تاوسـان: ۱. خنکان؛ خنکیان ‹هەناسەم دا بە ناڵە عەرزی حاڵـی کەم کە تاساوە/ لە خوێنـاوی دڵ و جـەرگم دەروونم کەیلە تا سینە «مەحوی»› ۲. مردن بـە نەخۆشـی پێران ۳. گێژ و وڕ بوون ≡ ۱. خفه شدن ۲. در اثر بیماری دیفتری مُردن ۳. گیج و منگ شدن

**تاساندن / tasandin/:** چاوگ. تاسانن؛ تاسنای: ۱. خنکاندن؛ خەنقاندن ۲. شڵـەژاندن؛ گێـژ کـردن ‹گـڕی ئـاخ بـەر مـەدە گیـانم/ بـە نیگـای ئاشـنای لێ‌کوژراوان مەمتاسێنە/ خۆم زامارم «سـوارە»› ≡ ۱. خفه کردن ۲. گیج/ سراسیمه کردن

**تاسانن / tasanin/:** ☜ **تاساندن**

**تاساوی / tasawî/:** ناو. کاسی؛ وڕی ≡ گیجی

**تاسب / tasib/:** ناو. نەیار؛ دوژمن ≡ دُشمن

**تاسران / tasran/:** چـاوگ. تاسـیای؛ خنکیـان؛ خنکان ≡ خفه شدن

**تاسکڵاو / task(i)ław/:** ناو. ۱. کڵاوخوود؛ کـڵاوی لـە ئاسـن ۲. کـڵاوی ژنانـەی موکریـانی ≡ ۱. کلاهخود ۲. نوعی کلاه زنانه

**تاسکە / taske/:** ناو. بانەگا؛ شەرم؛ بەرگـەدە؛ ئـەو شوێنە مووی بەرگەدەی لێ دەڕوێ ≡ شرمگاه

**تاسکەباب / taskebab/:** نـاو. تاسـکەواو: ۱. دەفرێکـی نیوەپـەل و قـووڵ ۲. تاسـکەبابی؛ جۆرێک چێشتی تەڕ، لە گۆشت و سێفزەمینـە و پیاز ≡ ۱. از ظروف آشپزخانه ۲. تاس‌کباب

**تاسکەبابی / taskebabî/:** ☜ **تاسکەباب-۲**

**تاسکەتاسک / tasketas(i)k/:** نـاو. لار و لەنجـە؛ ڕەوتی ڕۆیشتنی بـە لار و لەنجـە ‹هەڵیانماڵـیوە باسـک، باسـکی قەڵـەو و ناسـک/ کـە دەکـەن تاسکەتاسک، ڕەوەکتـرن لـە ئاسـک «هـێمن»› ≡ خرام

**تاسکەچەڵە / taskeçełe/:** نـاو. سیسـارگ؛ سیسارگەکەچەڵە ≡ کرکس

**تاسکەواو / taskewaw/:** ☜ **تاسکەباب**

**تاسمە / tasme/:** نـاو. ۱. مـەزرای چکۆلـە ۲. کاسمـە؛ بەلەچـەک؛ قاشـە کوولەکـەی وشک‌هەڵاتوو ۳. تەسمە؛ سیرمەی پانی قـایش یان چـەرم، بـۆ بەسـتن و زۆر کـاری تـر ≡ ۱. مزرعەی کوچک ۲. قـاچ کـدوی خشـک‌شـده ۳. تسمه

**تاسنای / tasnay/:** ☜ **تاساندن**

**تاس‌وتەبەق / tas û tebeq/:** ناو. خشـڵ‌وخـاو ≡ زیور زنانه

**تاسوخ**[۱] **/ tasux/:** ناو. تاسـوق؛ تاسـە؛ تامـەزرۆیی؛ عەزرەت؛ دڵبزۆکی ≡ آرزومندی

**تاسوخ**[۲]: ناوەڵناو. تاسوق: ۱. نوێ؛ تـازە؛ کـەبار ۲. تامەزرۆ؛ دڵبزۆک ‹بمدەیە گیانە، لە مێژە تاسوخم/ دایکەنە زوو ئەو تومانە تا سوخم «هێمن»› ≡ ۱. نـو ۲. آرزومند

**تاسوق / tasuq/:** ☜ **تاسوخ**

**تاس‌ولووس / tas û lûs/:** ناوەڵناو. ڕازاوە؛ جـوان ≡

آراسته

⊡ **تاس‌ولووس دان/ کردن**: ڕازاندنەوە ‹چەند هەتیو خۆی تاس‌ولووس دا، چوون بە پیری شێخەوە/ ... «شێخ ڕەزا»› ⚑ آراستن

**تاسۆکە** / tasoke/: ناو. زرک؛ تاسی چکۆلە ⚑ تاس کوچک مسین

**تاسوکەر** / tasûker/: ناو. پارسەک؛ سواڵکەر ⚑ گدا

**تاسولقە** / tasûlqe/: ناو. لەتەسواڵەت؛ ئەشکەولەت ⚑ قطعه‌ی سفالین

**تاسولکە** / tasûlke/: ناو. تاسیلە؛ پیاڵەی لە مس ⚑ پیاله‌ی مسین

**تاسە** / tase/: ناو. تامەزرۆیی؛ ئیشتیا؛ ئارەزوو؛ عەزرەت ‹چراغم تۆمەن، چراغم تۆمەن/ ئێندە مەن تاسەی دیداری تۆمەن «سەیدی»› ⚑ آرزو؛ اشتیاق

⊡ **تاسە شکیان**: کوڵ و مەراق دامرکان ‹ئاخ ڕۆڵەی شیرینم! هەر تاسەم لێت نەشکا› ⚑ تب اشتیاق خوابیدن

**تاسەی کەسێ/ شتێ کردن**: ئارەزووی کەسێ/ شتێ کردن ⚑ آرزو کردن

**تاسەبار** / tasebar/: ئاوەڵناو. تاسەخواز؛ تاسەدار؛ تاسەمەند؛ بەتاسە؛ ئارەزوومەند؛ بەئاوات؛ بەعەزرەت ⚑ آرزومند؛ مُشتاق

**تاسەبزوێن** / tasebizwên/: ئاوەڵناو. مروووهێن؛ هاندەری حەز و ئارەزوو ⚑ شوق‌انگیز

**تاسەخواز** / tasex(i)waz/: ☜ **تاسەبار**

**تاسەدار** / tasedar/: ☜ **تاسەبار**

**تاسەر** / taser/: ئاوەڵناو. بێ‌نا؛ هەرماو؛ لە بڕان دوور ⚑ بی‌نهایت

**تاسەشکێن** / taseş(i)kên/: ناو. مرووشکێن؛ هۆی دامرکانی حەز و ئارەزوو ⚑ موجب فروکش کردن اشتیاق

**تاسەمەند** / tasemend/: ☜ **تاسەبار**

**تاسەنگ** / taseng/: ناو. لاباری خوار؛ باری لار ⚑ بارِ کج

**تاسەنە** / tasene/: چاوگ. خنکان؛ نەفەس بڕان؛ پشوو نەمان ⚑ خفه شدن

**تاسەوە** / tasewe/: ناو. سەوەتەی گەورە؛ سەبەتا مەزن ⚑ سبد بزرگ

**تاسیان** / tasyan/: ☜ **تاسان**

**تاسیای** / tasyay/: ☜ **تاسران**

**تاسیلە** / tasîle/: ☜ **تاسولکە**

**تاسین** / tasîn/: چاوگ. شڵەژان؛ سەر لێ‌شێوان؛ حەپەسان ⚑ سراسیمه شدن

**تاش**[1] / taş/: ناو. ١. ماه وزەرد؛ تیشەشاخ؛ بەردی زۆر زل و هەڵکشاو لە کێو ٢. تەختەبەردی پان و لووس ⚑ ١. صخره‌ی صاف و بلند ٢. لاشەسنگ پهن و صاف

**ـ تاش**[2]: پاشەوشە. ـــ تراش؛ تاشەر ‹دارتاش؛ سەنگ‌تاش› ⚑ ـ تراش

**تاشا** / taşa/: ☜ **تەماشا**

**تاشان** / taşan/: چاوگ. *[مەجاز]* تەمێ بوون؛ جزیا دیتن ⚑ تنبیه شدن

**تاشاندن** / taşandin/: چاوگ. *[مەجاز]* تەمێ کردن؛ جزیا دان ⚑ تنبیه کردن

**تاشای** / taşay/: چاوگ. تاشین؛ تراشین ⚑ تراشیدن

**تاشت** / taşt/: ☜ **تێشت**

**تاشتەی** / taştey/: چاوگ. تاشین ⚑ تراشیدن

**تاشتی** / taştî/: ☜ **تێشت**

**تاشران** / taşran/: چاوگ. تاشیان؛ تراشیان ‹هونەر ناتوانێ جوانی تۆ بە هیچ شێوێکی بنوێنێ/ لە مەڕمەڕ چۆن دەتاشرێ هەیکەلی ئەم بەژن و بالایە؟! «هێمن»› ⚑ تراشیده شدن

**تاشراو** / taşraw/: ئاوەڵناو. ١. تراشراو؛ تاشیو؛ تاشرای؛ تاشیاگ ٢. سزادیتوو؛ تەمێ‌بوو ⚑ ١.

تراشیده ۲. تنبیه‌شده

**تاشرای** / taşray/: ☜ **تاشراو-۱**

**تاشک** / taşik/: ئاوەڵناو. چالاک؛ گورج و ئازا؛ مەزبووت؛ گورج و بەکار ☰ چُست و چالاک

**تاشەبەرد** / taşeberd/: ناو. تیشەشاخ ☰ تخته‌سنگ

**تاشەر** / taşer/: ناو. داتاش ☰ تراشنده

**تاشەوان** / taşewan/: ناو. شاخەوان؛ ڕازەوان؛ ئەوەی بە شاخاندا هەڵدەگەڕێ ☰ صخره‌نورد

**تاشی** / taşî/: ☜ **تراشی**

**تاشیاگ** / taşyag/: ☜ **تاشراو-۱**

**تاشیان** / taşyan/: ☜ **تاشران**

**تاشیای** / taşyay/: چاوگ. تاشران؛ تراشیان ☰ تراشیده شدن

**تاشین** / taşîn/: چاوگ. تراشین؛ لابردنی تووک و موو و ساف کردنی شتێ ‹نەخۆشی عیشقی لێوت وەسیەتی کرد/ بتاشن داری عوونابی بە تابووت «مەحوی»› ☰ تراشیدن

**تاشیو** / taşîw/: ☜ **تاشراو-۱**

**تاشیە** / taş(i)ye/: ئاوەڵناو. لێوەشاوە؛ شیاو؛ شایان؛ ژێهاتی ☰ شایان

**تاعوون** / ta'ûn/: ناو. بامرنێ؛ تاوننە؛ چاوقوولکە ☰ طاعون

**تاعین** / ta'în/: ناو. تاحین؛ هەڵوای کونجی و دۆشاو ☰ حلوای کُنجد و شیره

**تاغمە** / tağme/: ☜ **تەغمە**

**تاف** / taf/: ناو. ۱. هەرەت؛ جەنگە ‹مەولەویم دیبوو ئەوسا کە مابوو/ لە تافی پیری ئێستای منا بوو «پیرەمێرد»› ۲. ☜ **تافگە** ۳. گوڕە و هاڕە ٤. هێرش؛ پەلامار؛ هورووژم ٥. گوڕ؛ تاو؛ توان ☰ ۱. موسم؛ عنفوان ۲. ☜ **تافگە** ۳. غُرّش ۴. یورش ۵. نیرو؛ توان

⊡ **تاف دان**: بە گوڕە و هاژە ڕژانی ئاو یان تراوی تر ☰ جهیدن مایع

**تافاڵ** / tafał/: ناو. پاسار؛ پاسارە؛ گوێسوانە ☰ برآمدگی اطراف بام

**تافاو** / tafaw/: ناو. ئاوی بەقەوەت و زۆر تیژ و خوڕ ☰ آب پُرفشار

**تافتافینە** / taftafîne/: ☜ **تافگە**

**تافتە** / tafte/: ناو. جۆرێک تەنراو لە ئاورێشم ☰ نوعی پارچه‌ی ابریشمی

**تافگە** / tafge/: ناو. تاڤگە؛ تاف؛ تافیتە؛ تاڤیتە؛ تافە؛ تافینە؛ تافتافینە؛ تاوتاف؛ هەڵدێر؛ ئاوهەڵدێر؛ هاوشار؛ ئاوشار؛ ئاوشۆڕ؛ بافڵ؛ قەڵبەزە؛ سۆلاف؛ سولاف؛ سواف؛ سویلاف؛ سیتاف؛ سیتاڤک؛ سوولان؛ سەرووەشین؛ ڕیژاف؛ ڕێژاو؛ لێژاو؛ ئاوڕێژ؛ ئاوڕێژنگە؛ ئاولێژگە؛ ئاولێژنگە؛ ڕێژنگە؛ شۆڕک؛ شۆڕشۆرک؛ شەلالە؛ لووس؛ لووساو؛ لووساوک؛ سورک؛ سوپێل؛ سول ☰ آبشار

**تافە** / tafe/: ☜ **تافگە**

**تافەرەشک** / tafereşik/: ناو. ڕەشکە و پێشکەی چاوی ماندوو ☰ تاری چشم از فرط خستگی

**تافیتە** / tafîte/: ☜ **تافگە**

**تافینە** / tafîne/: ☜ **تافگە**

**تاڤ** / tav/: ناو. ۱. تیشک (خۆر و مانگ) ۲. تاڤی؛ تاوی باران؛ ڕێژنەبارانی توند ☰ ۱. تابش (ماه و آفتاب) ۲. رگبار باران

⊡ **تاڤ گرتن**: خۆر کەوتن ☰ طلوع کردن آفتاب

**تاڤاندن** / tavandin/: ☜ **تواندنەوە**

**تاڤزەرک** / tavzerik/: ناو. زەردەی خۆراوا؛ دەمەوئێوارە ☰ قبل از غروب

**تاڤک** / tavik/: ناو. ڕووناکی؛ ڕۆشنایی ☰ روشنی

**تاڤگە** / tavge/: ☜ **تافگە**

**تاڤل**[1] / tavil/: ئاوەڵناو. ئاسان؛ سانا؛ هاسان ☰ آسان

**تاڤل**[2]: ئاوەڵکار. زۆر زوو؛ هەر لەجێ؛ زووبەزوو ☰

بێ‌درنگ

**تاڤەبەر** / taveber/: ناو. تاڤێر؛ قووڵکە بەرد کە بارانی تێدا کۆ دەبێتەوە ☰ سنگ گود کە آب باران در آن جمع شود

**تاڤهەیڤ** / tavheyv/: ناو. مانگەشەو؛ تیشکی مانگ ☰ مهتاب

**تاڤی** / tavî/: ناو. تاوی باران؛ ڕێژنە باران ☰ رگبار باران

**تاڤیتە** / tavîte/: ☜ **تافگە**

**تاڤێر** / tavêr/: ناو. تاوێر: ١. تەرم؛ کەلەش؛ جەنازە؛ جەندەک ٢. تابووت؛ تاوت؛ داربەستی مردوو گواستنەوە ٣. ئەوەندەی دەنکە کە جارێک لە ساجدا بۆ دەدرێ ٤. قووڵکە بەردێ کە ئاوی باران ڕادەگرێ ٥. بەردی پانی نان برژاندن لە باتی ساج ٦. هەتەر؛ بەردی خلۆرەوە بوو لە بەرزی کێو ☰ ١. نعش؛ جنازه ٢. تابوت ٣. آن مقدار از غلّه که در یک نوبت بو دهند ۴. سنگ گودی که آب باران در آن جمع شود ۵. تخته سنگ صاف که بر آن نان بپزند ۶. سنگ غلتان از کوه

**تاق**[1] / taq/: ناو. ١. میچی بە کەوانە ‹واسیل بکە عەبیری سەلامم بە حوجرەکەم!/ چی ماوە، چی نەماوە، لە هەیوان و تاق و ژوور «نالی»› ٢. دەلاقە؛ تاقە؛ ڕفحەی قووڵ ٣. گومەز؛ گونبەز؛ گومەزی ٤. کەوڵی مەڕ و بزن ٥. یەکەی ئاو بەش کردن؛ بەشێ لە بیستوچوار بەشی ئاو ٦. دانێ؛ نیمەڕۆژە ڕێگە ٧. بەشێ دیاریکراو لە ماوەی کاری شەو و ڕۆژ ‹تاق شەوەکی› ☰ ١. تاق؛ سقف کمانی ٢. تاقچه ٣. گُنبد ۴. پوست بُز و گوسفند ۵. یک بیست‌وچهارم از سهم آب ۶. نیمروزه راه ۷. شیفت

**تاق**[2]: ئاوەڵناو. ١. تاک؛ تاکە ‹هەر تۆنی وە تاق دانا و تەوانا/ تۆم هەنی هەنی ئەو کێم بۆ هانا «مەولەوی»› ٢. بێ‌هاوتا و بێ‌وێنە ٣. واز؛ ئاوەڵا ‹ئەو درگا بۆچە تاقە؟› ☰ ١. فرد؛ تک ٢. یگانه؛ یکتا ٣. باز

**تاق**[3]: ئاوەڵکار. دانە ‹گوێزەکانی گشت برد، تاقی نەهێشت› ☰ یکی

⊡ **تاق بڕین**: هیچ نەهێشتن ☰ تمام چیزی را برداشتن

**تاقالاکەر** / taqalaker/: ئاوەڵناو. کۆشیار؛ تێکۆشەر ☰ ساعی

**تاقانە** / taqane/: ئاوەڵناو. تاکانە: ١. تەنیا (بۆ فرزەندی دای و باب) ‹تاقانە یەتیمی خەلەفی ئاخری نیسان/ تۆ خۆش بی، سەدەف بوو بە فیدات دوور بی لە ئافات «نالی»› ٢. بێ‌وێنە و هەڵکەوتە ‹گەوهەری تاقانە› ☰ ١. یکی‌یکدانه ٢. بی‌نظیر و نایاب

**تاقانەیی** / taqaneyî/: ناو. تەنێتی؛ کەتی ☰ وحدانیت

**تاقتاق**[1] / taqtaq/: ☜ **تاق‌تاق‌کەرە**

**تاق ـ تاق**[2]: ئاوەڵکار. یەک ـ یەک؛ دانە ـ دانە؛ تاک و ترووک؛ تاق و لۆق ☰ تک ـ تک

**تاق‌تاق‌کەرە** / taqtaqkere/: ناو. تاق‌تاق؛ تاک‌تاک‌کەرە؛ تاقڵە؛ تووتەک؛ تووتاک؛ قڕاوکە؛ قڕاکە؛ حەق‌حەق‌کەرە؛ هوموکەرە؛ پەلەوەرێکە قاوەیی ئاماڵبۆرە پەڕ و باڵی ڕێ ـ ڕێیە، لە ناو دارستان و کۆنە خانوان دەژی، مێروو دەخوا و زۆرتر شەوانە دەخوێنێ ☰ مُرغ شباهنگ؛ مُرغ حق

**تاقچە** / taqçe/: ناو. بالاڕف؛ ڕف؛ ڕەفە؛ ڕەفک؛ تاقە؛ سەرتاق؛ شوێنێ کە لە ناوقەدی دیواردا ساز دەکرێ، بۆ دانانی شتومەک لە سەری ☰ تاقچه

**تاقڕانی** / taq(i)řanî/: ناو. یەک قرانی زێو، پارەیەکی کۆنی ئێران ☰ سکەی نقرەای یک ریالی

**تاقڵە** / taqłe/: ☜ **تاق‌تاق‌کەرە**

**تـاقم** / taqim/: نـاو. ١. دەسـت؛ شـەش دانـە؛ یەکەی بـڕێ شـت (وەک: قـاپ، جـلوبـەرگ) ٢. دەستێک دەفری چینی ٣. دەستەی هاوکار ‹ئەم تاقمە مومتازە کەوا خاسسەیی شاهن/ ناشووبی دڵـی مەملەکـەت و قـەلبی سـوپاهن «نـالی»› ٤. ددانی دەسکرد ☰ ١. دست (شش‌تایی) ٢. یک دست ظرف چینی ٣. گروه همکار ۴. دندان مصنوعی

**تاقمان‌لەجووت** /taqmanlecût/: ☜ **تاقمانەجووت**

**تاقمانەجفت** / taqmanecift/: ☜ **تاقمانەجووت**

**تاقمانەجووت** / taqmanecût/: نـاو. تاقمانـەجفت؛ تاقمـانلـەجووت؛ تـاقوجـووت؛ تـاقوجفـت؛ تـاقیـانجفـت؛ تـاقنـەجفت؛ تـاقمەنـەجووت؛ تامانـەجووت؛ کالەمشـتێ؛ گەمەیەکـە، یـەکێک هێندێ شتی وردی وەک گەنم دەکاتە مسـتی و ئەوی دیکە جووت یان تاق بوونی بـەراورد دەکـا ☰ بازی تاق و جفت

**تاقمدار** / taqimdar/: ئاوەڵـناو. تاقمکـار؛ خـاوەن تاقم ‹کەوای گـروونی سەڵـتەی تاقمـدار/ چەتفـەی مەلیکی کێش و کڵاو لار «قانع»› ☰ دارای «تاقم»

**تاقمکار** / taqimkar/: ئاوەڵـناو. تاقمـدار؛ خـاوەن تاقم ‹داخی کەوای شۆڕ سەڵتەی تاقمکـار/ دایم لـە دڵما پێچ ئـەدا وەک مـار «مـوفتی پێنجـوێنی»› ☰ دارای «تاقم»

**تاقمەنەجووت** / taqmenecût/: ☜ **تاقمانەجووت**

**تاقنەجفت** / taqnecift/: ☜ **تاقمانەجووت**

**تاقوا** / taq(i)wa/: ناو. تکا؛ خوایش ☰ خواهش

**تاقوتەرا** / taq û tera/: ☜ **تاکوتوک**

**تاق و تـەنیا**[1] / taq û tenya/: ئاوەڵـناو. بـێهـێچ یاریکار و خزم و کەسێک ‹خوای تـاق و تـەنیا› ☰ تک و تنها

**تاق و تەنیا**[2]: ئاوەڵکار. تاقی‌تەنیا؛ بە تـاقی‌تـەنێ؛ بەبێ هیچ یاریکار؛ بـێ کـەس‌وکـار ‹تـاق و تـەنیا ڕۆیشت› ☰ تک و تنها

**تاقوجفت**[1] / taq û cift/: ☜ **تاقمانەجووت**

**تاقوجفت**[2]: ☜ **تاقوجووت**[2]

**تاقوجووت**[1] / taq û cût/: ☜ **تاقمانەجووت**

**تاقوجووت**[2]: ئاوەڵکار. تاقوجفت؛ یـەک ـ یـەک و جووت ـ جووت ‹تاقوجووت وەستاون› ☰ زوج‌وفرد

**تـاقولۆق**[1] / taq û loq/: ئاوەڵـناو. کـەم؛ تەکوتووک؛ یەک‌نەیەک ‹ڕێـواس کـاتی نـەماوە، تاقولۆق بووە› ☰ تَک‌وتوک

**تاقولۆق**[2]: ئاوەڵکار. تاقولۆقە؛ تاق ـ تاق لە کۆمەڵ ‹لـەو لەشـکرە گـەورە، چەنـد کەسـێک تـاقولـۆق گەڕانەوە› ☰ تک‌وتوک

**تاقولۆقە** / taq û loqe/: ☜ **تاقولۆق**[2]

**تاقە**[1] / taqe/: ناو. ١. ڕفـەی قـووڵ لـە دیـوار ٢. پارچەیەکە دەکرێتە پشت کـەوا ٣. تۆپـە؛ تـۆپ؛ یەکەی قوماش ☰ ١. تاقچە ٢. نوعی پارچە ٣. توپ پارچە

**تاقە**[2]: ئاوەڵکار. تاکە؛ یەکـە؛ یـەک دانـە ‹ڕۆح بـۆ نەکا فیدایی سەبا بولبولی نگار/ هەر تاقە سـروەیێکی دەوای سەد برین ئەکا «بێخود»› ☰ تنها

**تاقە**[3]: پێشوشە. تاکە ـ؛ یەک؛ تەک ‹تاقەکەسـی› ☰ تک ـ

**تاقەت** / taqet/: ناو. ١. هێز و توان؛ تابشـت ‹دڵ تینووە، سـووتاوە، بـەبێ تاقـەت و تـاوە/ ڕێگـەم بـە سـەراوە، کـە دەچـم ڕێم بەسـراوە «نـالی»› ٢. پـــڕزوویی؛ تـــەوتین؛ تـــەوات؛ پشـــوودرێژی؛ بێنفرەهـی؛ توانـایی ڕاوەسـتان لـە هەمبـەر سەخڵـەتی، دژواری یـان دۆخێکـی ناخۆشـەوە ‹چەپگەرد نمـازۆم سـاتێ فەراقـەت/ سـا خـودا یـا مەرگ یا وەسڵ یا تاقـەت «مەولـەوی»› ٣. کـار و ڕەوتی وەشارتن؛ شاردنەوە ☰ ١. تـاب و تـوان ٢. شکیبایی ٣. عمل پنهان کردن

⊡ **تاقەت تاق بوون:** وەڕەز بوون ‹بـە زوڵـفی تۆیـە وابەستە، لە من دڵ گەر پەرێشانە/ بە ئەبرۆی تۆیـە

پەیوەستە، ئەگەر تاقەت لە مـن تاقـە «نـالی»› 🇮🇷 حوصله سر رفتن

**تاقەت چوون**: وەڕەز بوون؛ بـێتاقـەت بـوون 🇮🇷 حوصله سر رفتن

**تاقەت کردن**: ١. نیاز پێـکهێنـان و جێبـەجێ کـردنی کـارێ ‹میوانـەکان تاقـەت کـە!› ٢. حاواندنـەوەی ئـاژەڵ و ئالـف کردنـە بـەریان ‹ولاخـەکانم تاقـەت کـرد› ٣. شـاردنەوە؛ قـایم کردن 🇮🇷 ١. پذیرایی کردن ٢. رسیدگی کردن بـه حیوانات ٣. پنهان کردن

**تاقەت گرتن**: دڵ بە خۆدا گرتن؛ هەڵکردن؛ خۆ ڕاگرتن 🇮🇷 تحمل کردن

**تاقەت هەبوون**: بە حەوسەڵـە بـوون 🇮🇷 حوصـله داشتن

**بێتاقەت بوون**: ☜ **تاقەت چوون**

**تاقەگوڵ / taqeguł/**: ☜ **پەنجەگیا**

**تاقی / taqî/**: ناو. ١. ئەزموون ٢. جـۆرێ کـڵاوی ژنانە ٣. تاک و تەنیایی 🇮🇷 ١. آزمون ٢. نوعی کلاه زنانه ٣. یکتایی

⊡ **تاقی بوونەوە**: بەر ئەزموون کـەوتن 🇮🇷 آزمـایش شدن

**تاقی کردنەوە**: تاقیـەو کـردن: ١. ئـەزموون؛ جەڕباندن؛ هەڵسەنگاندن ‹تـاقی ئەکەیتـەوە دڵ ئەیووبی بوردەبارت/ ڕوخسەت ئەدەی کە شـەیتان بۆی چێتە کونجی میحراب «قانع»› ٢. تەجرەبـە کردن؛ زانیاری وەرگرتن لە ڕێگەی دیتن، کـار پێکردن و ... ‹قوشقی بووم، دڵم واقی بـردەوە/ ڕێی هەڵاتنم تاقی کردەوە «هەژار»› 🇮🇷 ١. آزمودن ٢. تجربه کردن

**تاقیەو کردن**: ☜ **تاقی کردنەوە**

**تاقیان جفت / taq yan cift/**: ☜ **تاقمانەجووت**

**تاقیتەنێ / taqîtenê/**: ☜ **تاقیتەنیا**

**تاقیتەنیا[1] / taqîtenya/**: ئاوەڵناو. تـاقیتـەنێ؛ بێهەواڵ و کەس و کار ‹لە دنیـا تـاقیتەنیایـە› 🇮🇷 تک و تنها

**تاقیتەنیا[2]**: ئاوەڵکار. تاقیتـەنێ؛ بـەبێ هـەواڵ و کەس و کار ‹تاقیتەنیا هیچم پێ نـاکرێ› 🇮🇷 تک و تنها

**تاقیکراو / taqîk(i)raw/**: ئاوەڵناو. تـاقیکـراوە؛ تاقیەوەکراو؛ ئـازموودە؛ تەجرەبـەکراو 🇮🇷 امتحـان شده

**تاقیکراوە / taqîk(i)rawe/**: ☜ **تاقیکراو**

**تاقیگە / taqîge/**: نـاو. ئەزموونگـە؛ ئازمایشـگا؛ ئەزمێنگە؛ جێگایەک بە کەرەسەی پێویستەوە بۆ ئەنجامدانی ئەزموونگەلی زانسـتی و پیشـەیی 🇮🇷 آزمایشگاه

**تاقیلە / taqîle/**: ☜ **تەقیلە**

**تاقیەوەکراو / taq(i)yewek(i)raw/**: ☜ **تاقیکراو**

**تاقێک / taqêk/**: ئاوەڵکار. کرتک؛ دانەیەک 🇮🇷 یک عدد

**تاک[1] / tak/**: ناو. ١. یەکانە؛ نێرەبـەراز؛ ٢. کـەس؛ مـــرۆڤ (بەگشـــتی و بـــێڕەچـــاو کـــردنی تایبەتمەندییەکانی) ‹هەر تاکێکی پێگەیشـتوو مـافی ژیانی سەربەخۆی هەیە› ٣. هەرکام لـە ئەنـدامانی کۆمەڵێـک ‹هەموو تاکەکانی کۆمەڵـگای ئینسـانی› 🇮🇷 ١. گُراز نر ٢و٣. فرد؛ کس

**تاک[2]**: ئاوەڵنـاو. ١. تـاق؛ تـەک ٢. ئاواڵـە؛ کـراوە؛ وەرکی؛ باز ‹لە پەنجەرەی نیوە تـاکی بوومەلێلـەوە/ چاوی من لە دیمەنی کچی بەیانییە «سـوارە»› 🇮🇷 ١. تک ٢. باز

⊡ **تاک بوونەوە**: تاک کەوتن؛ تاکەو بـوون: ١. بـە تەنیا مانەوە ٢. جیا بوونـەوە لـە کۆمـەڵ 🇮🇷 ١. تنها ماندن ٢. جدا شدن از گروه

**تاک کەوتن**: ☜ **تاک بوونەوە**

**تاکەو بوون**: ☜ **تاک بوونەوە**

**تاکاندنەوە / takand(i)newe/**: چاوگ. تاکاننەوە؛

جیا کردنەوە؛ هەڵوەژاردن ☰ جدا کردن

**تاکاننەوە** /takannewe/: ☜ **تاکاندنەوە**

**تاکانە** /takane/: ☜ **تاقانە**

**تاکانەوە** /takanewe/: چاوگ. ١. جیا بوونەوە؛ تەنیا مان ٢. تاکیانەوە؛ بەجێ هێشتن ‹ئەو کۆترە لە هێلانەکەی ناتاکێتەوە› ☰ ١. جدا ماندن ٢. دور شدن

**تاکبەتاک** /takbetak/: ئاوەڵکار. هەمووی؛ تێکڕا ☰ همه

**تاک ـ تاک** /tak tak/: ئاوەڵکار. یەکە ـ یەکە؛ تاک بە تاک ☰ تک ـ تک

**تاکتاککەرە** /taktakkere/: ☜ **تاقتاقکەرە**

**تاکتیک** /taktîk/: ناو. ١. ڕێگەچارەیەکی شیاو و ئەوتۆ بۆ گەیشتن بە مەبەست ‹تاکتیکی ئەوە بوو کە بە هەڵبەز و دابەزی زۆرەوە، حەریفەکەی ماندوو بکا› ٢. زانست و فەنی وەدەست خستنی ئامانجگەلی دیاریکراو ‹تاکتیکی چەکداری› ☰ ١و٢. تاکتیک

**تاکژی** /takjî/: ئاوەڵناو. تەکژی؛ بە ژیانی تەنیا و دوور لە کۆمەڵ. بەرانبەر: **کۆمەڵژی** ☰ تکزی

**تاکسی** /taksî/: ناو. ماشێنی سەواری ناو شاران کە بە پارە مسافر دەبا ☰ تاکسی

▣ **تاکسی تەلەفونی**: ئاژانس؛ جۆرێک تاکسی کە بە تەلەفوون بانگ دەکرێت ☰ تاکسی تلفنی

**تاکسیبار** /taksîbar/: ناو. وانێتی بارکێش ☰ تاکسی‌بار

**تاکسیدیرمی** /taksîdîrmî/: ناو. فەن و زانستی وشکەوە کردن و پڕکردنەوەی کەوڵی زیندەوەران بۆ جوانی ☰ تاکسیدرمی

**تاکوتووک** /tak û tûk/: ئاوەڵکار. تاک و تەرا؛ تاقوتەرا؛ تاکوواز؛ یەکە ـ یەکە؛ یۆ ـ یۆ؛ دانەدانە؛ یەک لێرە یەک لەوێ ‹تاک و تووک دێی دوور، دووکەڵی چین ـ چین/ بەرز ئەکاتەوە بۆ ئاسمانی شین «گۆران»› ☰ تک‌وتوک

**تاک و تەرا** /tak û tera/: ☜ **تاک و تووک**

**تاک و تەریک** /tak û terîk/: ئاوەڵناو. تاق و تەنیا ☰ تک و تنها

**تاک و تەنیا** /tak û tenya/: ئاوەڵناو. تاق‌وتەنیا؛ تەک‌وتەنیا؛ بێ‌هەواڵ و بێ‌کەس‌وکار ‹شووەکەی کە مرد، تاک‌وتەنیا کەوت› ☰ تک و تنها

**تاک و لۆ** /tak û lo/: ئاوەڵکار. ١. تەک و لۆ؛ تاوەتا؛ تاق و لۆق ٢. دۆخی تێکئالانی شتێ، بەتایبەت بەن ☰ ١. تابەتا ٢. پیچ اُفتادن

▣ **تاک و لۆ کەفتن/ کەوتن**: تەک‌ولۆ بوون ☰ تابەتا شدن

**تاکوواز** /tak û waz/: ئاوەڵکار. تاک و تووک؛ تاک و تەرا ☰ تک‌وتوک

**تاکو** /takû/: ئامراز. تاوەکوو؛ هەتاکوو؛ هەتا ‹تاکوو فەرز مابێ سوننەت بەتاڵە «مەسەل»› ☰ تا

**تاکە**[1] /take/: ناو. سکەی تا قرانی زێو، پارەیەکی پێشووی ئێران ☰ یک ریالی نقره‌ای

**تاکە**[2]: ئامراز. تاکوو؛ هەتاکوو ☰ تا

**تاکە ـ تاکە** /take take/: ئاوەڵکار. تاک‌ـتاک؛ تاق‌ـ تاق؛ یەک‌ـیەک؛ یەکە ـ یەکە؛ دانەدانە ☰ تک ـ تک

**تاکەتی** /taketî/: ☜ **تاکەتێ**

**تاکەتێ** /taketê/: ئامراز. تاکەتی؛ تاکوو؛ هەتاکوو ☰ تا

**تاکەکەس** /takekes/: ناو. تاک؛ فەرد؛ مرۆڤ بێ ڕەچاو کردنی تایبەتمەندییەکانی ☰ فرد

**تاکەکەسی** /takekesî/: ئاوەڵناو. ١. یەک نەفەرە ‹چەند ساڵە لە ژوورێکی تاکەکەسی زیندانی کراوە› ٢. فەردی؛ سەر بە تاک یان پێوەندیدار بە تاکەوە ‹تورکیا خەریکە بگەڕێتەوە بۆ حوکمەتی تاکەکەسی› ☰ ١. انفرادی ٢. فردی

**تاکەوتاک / takewtak/**: ئاوەڵناو. لینگاولینـــگ؛ تاوتا؛ تاوەتا؛ تاک و لۆ (زۆرتر بـۆ کـەوش، گـۆرەوێ یان هەر جووتێک کە تایەکی تێک چووبێ دەگوترێ) ☰ لنگەبەلنگە؛ تابەتا

**تاکیانەوە / takyanewe/**: ☜ تاکانەوە ـ٢

**تالار / talar/**: ☜ تەلار

**تالاسیمی / talasîmî/**: ناو. نەخۆشییەکی بۆماوەیی خـوێنی کـە دەبێتـە هـۆی تێکچـوونی خرۆکـە سـووروەکان و سەرهەڵـدانی کـەمخوێنی لـە نەخۆشدا ☰ تالاسمی

**تالح / taliĥ/**: ☜ تالع

**تالع / tali'/**: ناو. تالح؛ تالە؛ بەخت ‹تـالعم نەحسـە دەترسم کە بـە ئـازاری فـیراق/ بمـرم و ڕۆژێ نـەبێ دەوڵەتی وەسڵم بە نەسیب «شـێخ ڕەزا»› ☰ طـالع؛ شانس

**تالگ / talig/**: ☜ تاڵشك

**تاللار / tallar/**: ☜ تەلار

**تالوق / taluq/**: ناو. کاری تەلاق دانی کـاتی و بـە مەرج ☰ طلاق رجعی

**تالوکە / taluke/**: ☜ تالوکە

**تالوکە / talûke/**: ناو. تەلووکـە؛ تالوکـە؛ قڕانگـە؛ مەترسیگا؛ هیلاک؛ جێگەی مەترسی فـەوتان ☰ مهلکه

**تالیتوسک / talîtusk/**: نـاو. تالـــیتوز؛ تـــانتۆز؛ گیایەکی بالابەرزە بە گوڵـی زەرد و گـەورەوە ☰ گیاهی است

**تالیلە / talîle/**: ☜ تەلیلە

**تالیمدراو / talîmd(i)raw/**: ئاوەڵناو. فێـر؛ ڕاهـاتوو ☰ آموزش دیده

**تالیمدەر / talîmder/**: نـاو. فێرکـار؛ ڕاهـێن ☰ آموزگار

**تالینوس / talînûs/**: نـاو. گیایەکـە لـە تالیشـکە دەچێ ☰ گیاهی است

**تالیوم / talyum/**: نـاو. تـوخمی کـانزایی نـەرم و ژەهری بە ژمارەی ئەتومی ٨١ و کێشی ئـەتومی ٢٠٤،٣٧، کە بـۆ دروسـت کـردنی ژەهـر و بـڕێ کەرستەی کارەبایی و شیشەسازی بە کار دێ ☰ تالیم

**تاڵ[1] / tal/**: نـاو. ١. تار؛ ئـامرازێکی مووسـیقایە ٢. کەمانچـە؛ ئـــامرازێکی مووســـیقایە ٣. هـــەڵاڵ؛ دەرمـــانی پێســـتە خـــۆش کـــردن ٤. ســـپڵ؛ پەشـاڕەش؛ خاڵخاڵـک ٥. داو؛ هـەودا ‹جووتـە پەلکەکەت لە یەک دراوە/ تاڵێکیان گـرژە، تاڵـێکیان خـاوە «فولکلـۆر»› ٦. تاڵـە؛ تـالا؛ بـەخت ٧. کەش‌وهەوای بارانی ☰ ١. ساز تار ٢. سـاز کمانچـه ٣. دوای دباغی ٤. طحـال ٥. رشـتەی نـخ ٦. طـالع؛ بخت ٧. هوای بارانی

◻ **تاڵ دان**: پێستە دە هەڵاڵ نان؛ دەباغی کردنی پێست ☰ دباغی کردن پوست

**تاڵ[2]**: ئاوەڵناو. تەحل؛ تەل؛ تیەل؛ تییـەل؛ تـەعل: ١. ژاعرین؛ ژاعرێنی؛ ژاحـرین؛ ژەحـرین؛ ژەحـر؛ تـەحل؛ ژوقـم؛ زیـەل؛ یـەک لـە چـوار چێـژەی سەرەکی ‹ساغەری مەی مەدە سـاقی! کـە لـە بـەر دووریی ئەو/ تالە وەک ژەهری هـەلاهیل لـە مـەزاقم مەیی ناب «شێخ ڕەزا»› ٢. *[مەجاز]* بەژان؛ ئازاردەر؛ ناخۆش؛ ناوەش؛ نە بە دڵ ‹فەزایی ئـەم جیهانـە وا بە تالی تێ مەگە! هەرچی/ لە عەرسەی کایناتایە بـە بێهوودە نەخولـقاوە «تـاهیر فـواد»› ٣. بـە ڕەنگـی زەردی مەیلەو ڕەش یان ڕەشی مەیلـەو زەرد ٤. بە ڕەنگی زۆر تۆخ ٥. *[مەجاز]* تووڕە و زویر ‹بۆچ وا تاڵ و توندی؟/ چی خراپەت لە من دی؟ «فولکلـۆر»› ☰ ١. تلخ ٢. ناگوار ٣. به رنگ زرد مایل بـه سیاه یـا بالعکس ٤. رنگ بسیار تیره ٥. عصبانی

◻ **تاڵ بوون**: *[مەجاز]* ١. درژ بـوون؛ گـرژ بـوون ٢. تووڕە بوون ☰ ١. ابرو در هم کشیدن ٢. عصـبانی شدن

**تاڵ داگەڕیان:** [مەجاز] ڕەش هەڵگەڕان لە تووڕەیی و ڕک ☰ تیره شدن از عصبانیت

**تاڵا / tała/:** ناو. بەخت؛ تاڵ ☰ طالع

**تاڵان / tałan/:** ناو. تاراج؛ تاڵوو؛ تاژان؛ پوڕ؛ پوویر؛ پویر؛ پووڕ؛ قرپ؛ کالات؛ کاڵەت؛ چەپاو؛ چەپلاو؛ تالان‌ومالان؛ کارەڕەهاتی وەرهاتن؛ بردنی ماڵ و سامانی خەڵکی بە زۆر و ئاشکرایی ☰ غارت؛ تاراج

◘ **تاڵان کردن:** بە زۆر و نابەدڵی ماڵی خەڵک بردن و دانە بەر خۆ ☰ غارت کردن

**بە تاڵان بردن:** بە ناحەقی ستاندن و بردنی ماڵی خەڵک ‹سێ مانگام هەبوو بە تالانی برد/ منالی هێشتم بە بێ ماست و دۆ «دڵدار»› ☰ بە یغما بردن

**تاڵانچی / tałançî/:** ☜ **تاڵانکەر**

**تاڵانکراو / tałank(i)raw/:** ناوەڵناو. دامەلاغاس؛ پوڕکری؛ گلاهە؛ شەلی ☰ غارت شده

**تاڵانکەر / tałanker/:** ناو. تالانچی؛ نژدە؛ نەژدڤان؛ پووڕکەر ☰ غارتگر

**تاڵانوبڕۆ / tałan û b(i)řo/:** ناو. [کینایە] ئاژاوە؛ پشێوی ‹لە تالان‌وبرۆ ئازان، لە ڕێگرتن هەموو وریان/ درۆ ناکەم، بپرسە وان، ئەمن دەیلێم و بێباکم «هێمن»› ☰ هرج‌ومرج

**تاڵان و ماڵان / tałan û małan/:** ☜ **تاڵان**

**تاڵانە / tałane/:** ناو. باخچە ☰ باغچە

**تاڵانی / tałanî/:** ناوەڵناو. بە تالان براو ‹کەلەشێرێ کە ئەگەر شێری نەری بێتە مەساف/ ڕاپەڕفێنن بە شەقێ، میسلی کەری تالانی «شێخ ڕەزا»› ☰ بە غارت رفته

**تاڵاو[1] / taław/:** ناو. ١. زۆنگ؛ چەلاو؛ ئاوپەنگ؛ پەنگاو؛ گەبەڵ؛ دەشتێک کە ئاوی مەندی تێدایە ‹ئەمێستەش گەرچی عەیش و عیشرەتت هەر تال و تالاوە/ بە مەرگی تۆ لە پاشانیش دەخۆی تالاوی تالاوی «نالی»› ٢. [مەجاز] دەرد و خەمی زۆر ‹ئەمانە لای من هەموو وەک تالاو/ شەرحی پێ ناوێ دەری‌خەم تەواو «فولکلۆر»› ☰ ١. تالاب ٢. غم و اندوه بسیار

**تاڵاو[2]:** ناوەڵناو. [کینایە] ژەهری‌مار؛ قوزەڵقورت؛ زۆر ناخۆش و ناڵەبار ‹ئەمێستەش گەرچی عەیش و عیشرەتت هەر تال و تالاوە/ بە مەرگی تۆ لە پاشانیش دەخۆی تالاوی تالاوی «نالی»› ☰ زهرمار

**تاڵاوی[1] / taławî/:** ☜ **تاڵاو[1]ـ١**

**تاڵاوی[2]:** ناوەڵناو. نیشتەجێی تالاو ☰ تالاب‌زی

**تاڵب / tałib/:** ناوەڵناو. خوازەر؛ داواکار؛ بەتەما ☰ طالب؛ خواهان

**تاڵچین / tałçîn/:** ☜ **تەڵبژێر[2]**

**تاڵحبین / tałiĥbîn/:** ناو. فالگرەوە؛ فالچی ☰ فال‌بین

**تاڵخ / tałix/:** ☜ **تخوب**

**تاڵشاری / tałşarî/:** ☜ **تاڵیشاری**

**تاڵشک / tałişk/:** ناو. تالگ؛ تالگە؛ تالوو؛ تالیش؛ تالیشکە؛ تالیشک؛ تالگ؛ تالوەتالە؛ تالیتۆس؛ تەحلی؛ تەحلیشک؛ بنەگیایەکی ئالفییە دانەکانی تالە و زۆرتر لە لێواری مەزرای گەنمدا دەڕوێ ☰ تلخه؛ گیاهی بسیار تلخ

**تاڵک / tałik/:** ناو. ١. تالوو؛ گیایەکە بنەکەی وەک دار دەسووتێنن و بە سووتاوی کوڵووی پێ دەڵێن ٢. جۆرێ هەرمێ ☰ ١. گیاهی کە ریشه‌اش را هیزم کنند ٢. نوعی گلابی

**تاڵکە / tałke/:** ناو. جۆرێ گڕکەیە، تا نەگەییوە تالە ☰ نوعی گرمک

**تاڵگ / tałig/:** ☜ **تاڵشک**

**تاڵگە / tałge/:** ☜ **تاڵشک**

**تاڵوتار / tał û tar/:** ناوەڵناو. [مەجاز] ناخۆش و ناڵەبار؛ سەخت‌وجەخار ‹ڕۆژی خۆشیت هاتە ئاسۆ ئەی گەلی خەمباری کوردا/ ڕۆژهەلات ڕۆشن دەکا شەوگاری

تاڵوتاری کورد «هەژار، *بۆکوردستان*» 🇮🇷 تیره و تار

**تاڵ و توون** / tał û tûn/: ئاوەڵناو. ١. تـاڵ و تیـژ؛ تاڵ و توند ٢. *[کینایە]* ڕقهەستاو؛ ناوچاوگرژ 🇮🇷 ١. تلخ و تُند ٢. عصبانی

**تاڵوەتاڵە** / tałwetałe/: ☜ **تاڵشك**

**تاڵو** / tałû/: ناو. ١. ☜ **تاڵشك** ٢. ☜ **تاڵان**

**تاڵوکە** / tałûke/: نـاو. پەلـە؛ لـەز؛ عەجەلـە 🇮🇷 شتاب

**تاڵە**[١] / tałe/: ناو. ١. ڕەشی خۆڵەمێشـی؛ ڕەشـی کەوە؛ ئەسمـەری ئامـاڵڕەش ٢. بـەخت؛ تـالح؛ نگین؛ هات ‹من تالەم وە تال تالی تال وەردە/ گەرد بەدبەختیم وە ڕوودا مەردە «مەولەوی»› ٣. تاڵـووی کۆڵوو ٤. جۆرێ هەرزن ٥. مرۆر؛ دەنکێکی تاڵـە لە ناو گەنمدا 🇮🇷 ١. سیەفام ٢. طالع ٣. گیـاهی تلـخ کە کبک آن را دوست دارد ۴. نـوعی ارزن ۵. دانـەی سیاه و تلخ قاطی گندم

**تاڵە**[٢]: ئاوەڵناو. ١. بە ڕەنگی ڕەشـی خۆڵەمێشـی؛ ڕەشی کـەوە؛ ئەسمـەری ئامـاڵڕەش ٢. *[مەجاز]* بێفەڕ و شووم ٣. ئاژەڵی سپی، سەر و چـاو بـۆر 🇮🇷 ١. سیەفام ٢. نحس؛ شوم ٣. حیـوان سـفید سـر و صورت خاکستری

**تاڵەکە** / tałeke/: ناو. زڵ؛ مێورەی باریکی ڕەز 🇮🇷 شاخەی باریک تاک

**تاڵەمێو** / tałemêw/: ناو. مرۆر؛ دەنکێکی ڕەشـی تاڵە لە ناو گەنم پەیدا دەبێ 🇮🇷 دانەی سیاه و تلـخ قاطی گندم

**تاڵەوبۆر** / tałewbor/: ئاوەڵناو. بۆری ئامـاڵ ڕەش 🇮🇷 فیلی

**تاڵەوبۆربەڵەک** / tałewborbełek/: ئاوەڵناو. بۆری ئاماڵ ڕەش بە پەڵـەی سـپییەوە 🇮🇷 ابلـق فیلـی و سفید

**تـاڵی** / tałî/: ناو. ١. تەلحی؛ تییەڵی؛ تـامی تاڵـی ‹ئاوی سوێری چاو و باری تاڵی لێو/ سوێر و تاڵی دەم دەم و ژەم ژەم دەخۆم «نـالی»› ٢. *[مەجاز]* دەرد و مەینەت و کـوڵ و کەسـەر 🇮🇷 ١. تلخـی ٢. درد و رنج

**تاڵیتوز** / tałîtuz/: ☜ **تاڵیتوسك**

**تاڵیتوسك** / tałîtusk/: نـاو. تاڵـیتۆز؛ گیایـەکی باڵابەرزە بە گوڵـی زەرد و گرۆڤـەرەوە 🇮🇷 گیـاهی است

**تاڵیتۆز** / tałîtoz/: ☜ **تاڵیتوسك**

**تاڵیتۆس** / tałîtos/: ☜ **تاڵشك**

**تاڵیتوک** / tałîtûk/: ناو. گیایەکە 🇮🇷 گیاهی است

**تاڵیش** / tałîş/: ☜ **تاڵشك**

**تاڵیشاری** / tałîşarî/: ناو. تاڵشـاری؛ قاڵـیشـاری؛ هــەزاوا؛ عــەزاوا؛ ئــەزوا؛ هــەزوا؛ عــەزوا؛ مــوڕ؛ ژەقنەمووت؛ گیایەکی سەلکداری گەڵائەستووری قەراخ دڕکاوییە، شـیراوەیەکی تاڵـی لـێ دەردێ کە بۆ دەرمان دەشێ 🇮🇷 صبر؛ الوا

**تاڵیشک** / tałîşk/: ☜ **تاڵشك**

**تاڵیشکە** / tałîşke/: ☜ **تاڵشك**

**تـاڵی و سوێری** / tałî w s(i)wêrî/: نـاو. *[مەجاز]* دەرد و چەوسانەوەی زۆر 🇮🇷 درد و رنج زیاد

**تام** / tam/: ناو. ١. چێـژە؛ چێـژ؛ چـەژە؛ چەچـە؛ چەش؛ چەشکە؛ چێشکە؛ چاژ؛ چاش؛ مێ؛ مەزە؛ مەی؛ مێلاک؛ میلاک؛ چست؛ چۆنیەتییـەک لـە برێ شتدا کە بەشێک لە ئەنـدامی چێـژای سـەر زمان دەبزوێنـێ ‹تـامی شـیرین؛ تـامی تـرش› ٢. *[مەجاز]* هەستێ کە بـە هـۆی ئەزموونـەوە پەیـدا دەبێ ‹تامی سەرکەوتن› ٣. *[کینایە]* چـەورایی بـۆ چێشت 🇮🇷 ١و٢. مزه ٣. چربی غذا

▣ **تـامی دەم**: ١. تـامی نـاو دەم ‹تـامی دەمـم ناخۆشە› ٢. *[مەجاز]* بۆی دەم؛ نیاز و مراز ‹بزانـە تامی دەمی چەس، جا تەکیا مامەڵـە بکـە!› 🇮🇷 ١. مزەی دهان ٢. نظر؛ قصد

▣ **تام دان**: ١. تامی شتێ پێوە بوون ‹ئاوەکە تامی

خوێ ئەدا› ۲. ڕووکێش کردن (بە زێڕ یان زیو) 🇮🇷 ۱. طعم داشتن ۲. روکش گرفتن

**تام کردن** ۱. بۆ زانینی تامی شتێک، نەختێکی لە زار نان ۲. *[کنایە]* خواردن ‹ئەمساڵ، تامم نەکردووە› 🇮🇷 ۱. چشیدن ۲. خوردن

**تامار** / tamar/: ناو. تەم؛ مژ ‹تامارا خەوێ سەر چاڤێم داهات› 🇮🇷 مه

**تامازرۆ** / tamazro/: ☜ **تامەزرۆ**

**تامان** / taman/: ناو. ۱. ☜ **تەیمان** ۲. ☜ **تەمەن**

**تاماندن** / tamandin/: چاوگ. متوربە کردنی دار 🇮🇷 پیوند زدن درخت

**تاماندی** / tamandî/: ئاوەڵناو. متوربەکراو 🇮🇷 پیوند شده

**تامانەجووت** / tamanecût/: ☜ **تاقمانەجووت**

**تاماو** / tamaw/: ناو. شۆرباو هێلکە 🇮🇷 نوعی آش

**تامپون** / tampun/: ناو. تەنزیف؛ گرمۆڵەی لۆکە، هەور یان پەڕۆ کە بۆ هەڵمژینی خوێن و ڕیمی کون و کەلێنی لەش بە کار دێت 🇮🇷 تامپون

**تامتیژی** / tamtîjî/: ناو. نۆ 🇮🇷 تندمزگی

**تامتیژ** / tamtîj/: ئاوەڵناو. گووزی؛ تون؛ توون 🇮🇷 تُندمزه

**تامخوا** / tamx(i)wa/: ناو. تاموخوا؛ چێژە؛ کاری چێشتنی چێشت 🇮🇷 عمل چشیدن غذا

**تامخۆش** / tamxoş/: ئاوەڵناو. وەشەی؛ خۆش‌تام 🇮🇷 خوشمزه

**تامدار** / tamdar/: ئاوەڵناو. بەتام؛ خۆش‌چێژە 🇮🇷 لذیذ

**تامژاندن** / tamjandin/: چاوگ. فێر کردنی ساوا بۆ مەمک مژین 🇮🇷 آموختن مُک زدن به نوزاد

**تامژین** / tamjîn/: چاوگ. فێر بوونی مەمک مژین 🇮🇷 مُک زدن آموختنِ نوزاد

**تامسار** / tamsar/: ئاوەڵناو. چێژەناخۆش 🇮🇷 بدمزه

**تامک** / tamik/: ناو. چەشتەی تەڵە؛ چێژەی داو 🇮🇷 طعمه

**تامڵ** / tamił/: ناو. سەبر و قەرار ‹هەی هەوو های چەندێن نامان خەبەرێ/ تای تامڵ بڕیان نەسیم سەفەرێ «مەولەوی»›. هەروەها: **تامڵ کردن؛ تامڵ گرتن؛ تامڵ هاوردن** 🇮🇷 تحمل

**تامناخۆش** / tamnaxoş/: ئاوەڵناو. گول 🇮🇷 بدمزه

**تاموبۆ(ن)** / tam û bo(n)/: ناو. چێژە و بۆن و بەرامە 🇮🇷 مزه و بو

**تاموتەوشک** / tam û tewişk/: ناو. تام و مەزە 🇮🇷 طعم

**تاموخوا** / tam û x(i)wa/: ☜ **تامخوا**

**تاموخوێ** / tam û x(i)wê/: ناو. *[مەجاز]* چێشتی ڕۆن و خوێ و ئاو 🇮🇷 آش چربی و نمک

⊡ **تاموخوێ کردن** لە چێشتی سەر ئاگر چێشتن بۆ تاقی کردنەوەی ڕادەی خوێ و ڕۆن و ئەدوا 🇮🇷 چشیدن غذا

**تامولام** / tam û lam/: ناو. ئاب‌وتاب؛ ئاووتاو 🇮🇷 آب‌وتاب

**تامووسک** / tamûsk/: ناو. داموسک؛ داوی کلکی یەکسم ‹تارچی! تاموسکت با ڕیشەی دڵ بێ/ مەقامێ بڵێ کە دڵ خەجل بێ «قانع»› 🇮🇷 تار موی دُم ستور

**تامەچێشت** / tameçêşt/: ناو. *[کنایە]* خواردەمەنییەکی زۆر کەم ‹چش کە شک نابەم لە ماڵێ تامەچێشت/ داخەکەم نیمانە زارجوویەک بنێشت «هێمن»› 🇮🇷 کمترین خوراکی

**تامەزرۆ** / tamezro/: ئاوەڵناو. تامازرۆ؛ تەمارزوو؛ ئاواتەخواز؛ ئارەزوومەند؛ ئاواتەواز؛ هیوادار؛ داڤەگر؛ پاپا؛ تاسەبار؛ کاسۆتی؛ دڵبژۆک؛ بینەکەر؛ ئەلهاکەر؛ زۆر بەتاسە ‹تامەزرۆی دیداری تۆم›. هەروەها: **تامەزرۆیی** 🇮🇷 مشتاق؛ آرزومند

**تامیسک** / tamîsk/: ناو. تێمیسک؛ تێمێسک؛

تمیسک؛ ئێمشک؛ خشرۆک؛ کەرمشـک؛ یـاومز؛ یاونیشان؛ زڕپـک؛ زیپکـەی ویرووسـی دەور دەم کـە بـە هـۆی نەخۆشـی (بەتایبـەت یـاو یـان ڕاچلەکین)ەوە سەر هەڵدەدا ☰ تبخال

**تامین / tamîn**/: ئاوەڵناو. بەتام؛ تامدار؛ چێژەخۆش ☰ خوشمزه

**تان¹ / tan**/: ناو. ١. کات؛ وەخت ٢. هێز و توان ٣. ڕاهێلی تەون ٤. تیغە؛ نێوان ٥. تانە؛ پەڵەی سەر گلێنەی چاو ٦. ☜ **تەیمان** ☰ ١. وقت ٢. توان ٣. تار؛ همتای پود ۴. تیغه ۵. لکەی روی مردمک چشم ۶ ☜ **تەیمان**

▣ **تان دەرکەوتن**:/کینایە/ ١. زۆر کۆن بوونی جل و پەڵاس ٢. عەیب و عار ئاشکرا بوون ☰ ١. نخ‌نما شدن ٢. فاش شدن

▪ **تان²**: جێناو. ١. جێنـاوی خاوەندارێـەتی لکـاوی دووهەم کەسی کۆ (بۆ ڕێز نـان لـە یەکـەم کەسـی تـاکیش دەگـوترێ) ‹کتێبتـان وەرگرتـووە؟؛ چەنـد کەسن؟ تا نانتان بـۆ بنێـرین› ٢. جێنـاوی لکـاوی دووهەم کەسی کۆ لە کاری ڕابـردوودا ‹هێناتـان؛ خواردتان؛ بردتـان؛ داتـان› ٣. جێنـاوی بـەرکاری لکاوی دووهەم کەسـی کـۆ لـە کـاری ڕابـردوودا ‹بردتانیان› ☰ ١. ضمیر متصل دوم شخص جمع ٢. ضمیر متصل دوم شخص جمع در افعال ماضی ٣. ضمیر متصل مفعولی دوم شخص جمع در افعال ماضی

**تانتالیوم / tantalyum**/: ناو. توخمێکی کیمـایی بـە ژمـارەی ئـەتومی ٧٣ و کێشـی ئـەتومی ١٨٠,٩٤، کە کـانزایێکی سـەخت و خـۆڕاگر لـە بەرامبـەر ئەسـیدەوەیە و لـە پیشەسـازی بـۆ دروست کردنی ئامرازی برینکاری بە کـاری دێ ☰ تانتالیم

**تانتۆز / tantoz**/: ☜ **تالیتوسك**

**تانج / tanc**/: ☜ **تاج**

**تانجزێڕین / tanczêřîn**/: ناو. پەلەوەرێکە سـەری زەردە و دوو هێڵی ڕەشی پێدا هـاتووە، کاکۆڵـی نێرە نارنجییە و هی مێیـە زەردی کاڵـە، پشـتی سەوزی زەیتوونییە بەر زگی زەردی ئاماڵ سپییە ☰ تاج‌طلایی

**تانجکۆڵەکە / tanckołeke**/: ناو. کۆتـەداری سـەر ئەستوون کە دەکەوێتە بەینی کاریتە و وێستوون ☰ سرستون

**تانجکەڵەشێر / tanckełeşêr**/: ☜ **تاجخرووس**

**تانجۆکە / tancoke**/: نـاو. ١. لیزگـە مـووی سـەر توێڵ ٢. پەرچووکەی سەر هەنی ☰ ١. کاکُل روی پیشانی ٢. رشتەی مُهره بر پیشانی

**تانجە / tance**/: ☜ **تاج**

**تانجی / tancî**/: ناو. ١. تاژی؛ تانزی؛ سەگی ڕاو ٢. ☜ **تاجخرووس** ☰ ١. تازی ٢. ☜ **تاجخرووس**

**تانجیپێغەمبـــــەر / tancîpêğember**/: ☜ **تاژیلۆکە**

**تانجیپێغەمبـــــەرە / tancîpêğembere**/: ☜ **تاژیلۆکە**

**تانجیقولانج / tancîqulanc**/: ☜ **تاژیلۆکە**

**تانجیک / tancîk**/: ☜ **تاجەگوڵینە**

**تانجیلۆکە / tancîloke**/: ☜ **تاژیلۆکە**

**تانجیە / tanc(i)ye**/: ☜ **تاژی**

**تانجیەوان / tannc(i)yewan**/: ☜ **تاژیوان**

**تاندون / tandun**/: ناو. ماسوولکەژێ؛ ڕەفیسکە ☰ تاندون

**تانزی / tanzî**/: ☜ **تاژی**

**تانستن / tanistin**/: چـاوگ. تـوانین؛ تـانین ☰ توانستن

**تانشین / tan(i)şîn**/: ئاوەڵناو. نیشتوو؛ بن‌نیشـتوو؛ بێخ‌گرتگ ☰ تەنشین

**تانک / tank**/: ناو. تانگ: ١. مەترالێزە؛ مـەترەلۆز؛ دەبابە؛ ڕەواندژ؛ ماشێنی زرێداری شەڕ کە تۆپ و

شیستتیری لە سەر داندراوە ۲. تـانکی؛ تانکـەر؛ تانکێرە؛ دەفری گەورەی سەرداپۆشراو، جێ ئاو و نەوت و... ☰ ۱. تانک جنگی ۲. تانکر مایعات

**تانکر / tankir/**: ناو. تـانکێرە؛ تانکـەر؛ تـانکی: ۱. تانک؛ دەفری گەورەی سەرداپۆشـراو، جـێئـاو و نـەوت و... ۲. کەشـتی یـان ماشـێنی گـەورەی گواستنەوەی تراو ☰ ۱. تانکر مایعات ۲. کشتی یـا کامیون حمل مایعات

**تانکەر / tanker/**: ☜ **تانکر**

**تانکی / tankî/**: ☜ **تانکر**

**تانکێرە / tankêre/**: ☜ **تانکر**

**تانگ / tang/**: ☜ **تانك**

**تانگۆ / tango/**: ناو. جـۆرە هەڵـپەڕینێکی نـەرم و نیانی دوو کەسی ڕۆژاواییە ☰ تانگو

**تانوپۆ / tan û po/**: ناو. ۱. ڕاهـێڵ و تێـوەدان ۲. *[مەجاز]* بنـە و بنەچەکـە ۳. *[مەجاز]* ڕایـەڵ و پـۆ؛ پێکهاتـە؛ چۆنـاوچۆنی دارێژراویـی شـتێک ‹... تەفرەقـە هـەر وەک خـۆی مـاوە و لـە سـایەی ئـەم تەفرەقەیەش تان و پۆی موسوڵمانەتی هەڵوەشـاوە و ئاڵۆزاوە و کاری دیندوژمن لـە بـاوە! «هـەژار، *چـوار نامیلکە*»› ☰ ۱. تار و پود ۲. اصل و نسب ۳. ساختار

▣ **تانوپۆ ناورێشم**: *[کینایە]* بەر و پشـت ئەتڵـەس؛ نەجیمزادە؛ عەسڵزادە ☰ نجیبزادە

**تانۆت / tanot/**: ناو. خەموخەفەت؛ کـوڵوکەسـەر ☰ اندوە

**تانووت / tanût/**: نـاو. سـەرکۆنە؛ لۆمـە؛ تانـە ☰ سرزنش

▣ **تانووت لێدان**: گەمە/ تیز پێکردن ☰ طعنە زدن

**تانە / tane/**: نـاو. ۱. تەشەر؛ عەیب؛ لۆمە؛ لەوجە؛ تانووت؛ ئەوەی بـۆ سـەرکۆنە دەگـوترێ ‹وە تـیر تانەی ڕەقیب دڵسەنگ/ بینایی دیدەم خـاتر مەکـەر تـەنگ «مەولـەوی»› ۲. سـەرکۆنە؛ سـەرکۆ؛ سـەرزەنش؛ سـۆرین؛ تـەوس؛ تـوانج؛ کـاری لێپرسینەوە، پلار تێگرتن و بە گڤا چوون لە بەر ئاکـاری ناشـیرین ‹ئـەو کەسـانە تـەوس دەگرنـە براوادارانێ کە زێدە لە زەکات، خێراتێ دەکەن؛ تانەش دەدەن لەوانە وا هەر ئەوەندەیان دەس دەڕوا «هەژار، *قورئان*»› ۳. پەڵەی سەر گلێنەی چاو ‹ئێستا ئـەو شوێنە کەوا وێرانـە/ بـۆ چـاوی هێـوام بـووە بـە تانـە «پیرەمێرد»› ٤. ئالاش؛ هەلاش؛ هەژگ؛ کەواشە؛ گەڵا و چڵووی سەر دارەڕا ۵. ☜ **تـەیمان** ☰ ۱. طعنە ۲. انتقاد ۳. لکەی مردمـک چشـم ۴. انبیـرە ۵. ☜ **تەیمان**

**تانەن / tanen/**: نـاو. جەوهـەرمازوو؛ تراوێکـی لـە شینکە گیراو بۆ دەباغی و ڕەنگرێژی و... بە کـار دێ ☰ تانن؛ شیرەی مازو

**تانین / tanîn/**: ☜ **توانین**

**تـانێ / tanê/**: ئاوەڵـکار. کەمووکەیـەک؛ کەمووسـکەیەک؛ تـۆزێ؛ تۆزقاڵـێ؛ تۆزکاڵـێ ☰ اندکی؛ کمی

**تـاو[1] / taw/**: نـاو. ۱. تیشـکی هـەتاو ۲. ڕێژنـەی باران ۳. تاڵ؛ هەودا ٤. کاری غاردانی توند ‹هـەر کەسێ ئەسپی ئەجەل تاو دا لە سەر عەرسـەی فـەنا/ پـێ بنێتـە بـەزمگاه و مەعرەکـەی مەیـدانی کـورد «قانع»› ۵. *[مەجاز]* سوێ و ئارەزوو ‹لە تاوی تۆ زۆر عاجز بوو› ٦. *[مەجاز]* ترس؛ خۆف ‹لـە تـاوان دڵـی تـۆقی› ۷. تـا؛ داگیرسـانی لـەش لـە نۆبـەتی ۸. توندی و تیژی گەرما ‹چوون دانەی سەر ساج بـەر ئامام جارجار/ جـە تـاو دووکـەڵ جـە شـەرارەی نـار «مەولـەوی»› ۹. تاقـەت و تـوان ۱۰. ژانی بـڕین ۱۱. لەز؛ پەلە ۱۲. دەمێکی کورت؛ کاتێکی کـەم ‹لەم ژینە کە هەر دەمێکە دێت و دەڕوا/ مەردایـەتی مەفرۆشـە لـە پێنـاو تاوێـک «هـەژار، *چوارینـەکانی خەییام*»› ۱۳. توندی؛ گوژم ‹لە تاو برسییەتی ئاگام لە هیچ نەبوو!› ☰ ۱. اشعەی خورشید ۲. رگبار بـاران ۳. تارِ نخ ۴. تاخت ۵. آرزو ۶ ترس ۷. تَب ۸. حرارت؛

تف ۹. تاب؛ توان ۱۰. دردِ زخم ۱۱. عجله ۱۲. مـدتی کوتاه ۱۳. فشار

⊡ **تاو بردن:** خۆر بردن ☰ آفتابزده شدن

**تـاو دان:** ۱. توند غاردانی ئەسپ و... ‹تێغی زۆر و سـتەم سـاو دە/ ئەسـپی جیهـانگیری تـاو دە «گۆران»› ۲. با دان؛ کرژ کردنـەوە ۳. بـاو دان؛ پاڵ پێوە نان (جوڵانـە) ٤. هەڵگیرسـاندنی زۆر توندی ئاگر (کوورە و ...) ٥. هەشتاو/ لـەز پـێ دان ‹دەی خێرا کە! ئەو ماشینە تاو دە با بگەین!› ٦. هـان دان؛ هەڵـخڕاندن ‹هێنـدەیان تـاو دا، تووشی ئەو بەڵایە بوو› ☰ ۱. تـاختن (بـا اسـب) ۲. تاب دادن (نـخ) ۳. تـاب دادن (تـابِ بـازی) ۴. تـف دادن آتش (بخاری و ...) ۵. شتاب دادن ۶. تحریـک کردن

**تـاو سەندن:** ۱. تیژ بوون لە گەرمیـدا ‹ئاگرەکـە تـاوی سـەند› ۲. تونـد بـوون لـە سـووڕاندا ‹خولخەلەکە تاوی سەند› ☰ ۱. شدت یافتن گرما ۲. به شدت چرخیدن

**تاو کردن:** لە خشتە بردن؛ ساز کردن و فریودان ‹کابرا ئەم ژنەی تاو کردووە› ☰ فریب دادن

**تاو گرتن:** توند وە کار کەوتن ☰ شتاب گرفتن

**تـاو لێهـاتن:** ۱. تیشـکی خـۆر وێکـەوتن ۲. بێئۆقرە بوون ۳. نۆبەتی لێهـاتن ☰ ۱. آفتـاب دمیدن ۲. بیتاب شدن ۳. دچار تب شدن

**تاو نیان:** نیانە شوێنەوە؛ ڕاو نان؛ هەڵبڕین؛ دەم لە دوو نان ☰ با شتاب دنبال کردن

**ـ تـاو**[۲]: پاشەوشـە. ۱. تـواوەوە ‹قیرەتـاو› ۲. بـادراو ‹پێتاو› ۳. کەوتوو ‹خۆرەتاو› ٤. هـەزم ‹دێرتـاو› ٥. تاودەر ‹تـۆپتـاو› ☰ ۱. ذوب شـده ۲. ـــ تـاب؛ تابیده؛ تاب خورده ۳. ـ تاب؛ تابیده ۴. هضم ۵. شتاب دهنده

**تـاو**[۳]: دەنـگ. وشـەی دەنـگ دانی ڕان بـۆ ئـاو خواردنەوە ☰ کلمەی خواندن گله به سوی آبشخور

**تاوار / tawar/:** ☜ **تەوار**

**تاوان**[۱] **/ tawan/:** چاوگ. توانەوە؛ تاویانەوە ☰ ذوب شدن

**تـاوان**[۲]: ناو. ۱. گونا؛ گوناه ؛ گونەه ؛ گوناح؛ گوناد؛ گوناسە؛ گوناسا؛ خەتا؛ سووچ؛ بەزە؛ هەڵە؛ فیـت؛ فیک؛ بژارە؛ پیازە؛ ئۆبال؛ ئازوبەزە؛ وەبـاڵ؛ قـۆڕن؛ کاری ناڕەوا لە چاو قانوون کە شیاوی سزایە ‹وات جە دیدەی بەد من پێم نەیاوان/ خەتای کەس نییەن، جە وێمەن تـاوان «سـەیدی»› ۲. تەشـبی؛ بـژارە؛ خیسل؛ ئەوەی لە قـەرەبووی زیانـدا بـدرێ یـان وەربگیردرێ ‹دەبێ تاوانـی ئەو شیشـەی شـکاندت بدەی!› ☰ ۱. گناه ۲. تاوان؛ غرامت

⊡ **تاوان دان:** جەریمە بژاردن ☰ خسارت دادن

**تـاوانبـار / tawanbar/:** ناوەڵـناو. تاوانـــدار: ۱. خـــەتابار؛ گوناکـــار؛ گونابـــار؛ خـــەتاکار ۲. جەریمەکراو؛ جەریمەلەسەر؛ ئەوی دەبێ قەرەبوو بکاتەوە ☰ ۱. گناهکار ۲. جریمه شده

**تاواندار / tawandar/:** ☜ **تاوانبار**

**تاواندن / tawandin/:** ☜ **تواندنەوە**

**تاواندنەوە / tawand(i)newe/:** ☜ **تواندنەوە**

**تاواندەر / tawander/:** ناو. جەریمەبژێر؛ بژێرەوەی زیان ☰ غرامتپرداز

**تاوانکـار / tawankar/:** ناوەڵـناو. تایبەتمەنـــدی ئەوەی کردەوەی لەگەڵ تاواندایە ‹بێتاوان لە پاڵ یارە، تاوانکار لە پای دارە «مەسەل»› ☰ گناهکار

**تاوانگاز / tawangaz/:** ناوەڵناو. تاوگـەز؛ تاوەنگـاز؛ تاوەنگەز؛ تاوەگاز؛ تاوەگەز؛ هەتاوگـەز؛ خۆرانگـاز؛ خۆرەنگـــاز؛ ڕۆژگـــاز؛ ڕۆژگـــەز؛ ڕۆژگەســـتی؛ هۆرگەســـتە؛ هۆرگـــەز؛ تـــاوبردوو؛ تـــاوبردە؛ تاوەسووت؛ خـۆربردوو؛ تووشـیاری تاوانگـازی ☰ آفتابزده

**تاوانگـــازی / tawangazî/:** نـــاو. گەرمەژنـــــە؛ تاوبردوویی؛ ڕەوتی تێکچوونی حاڵی مرۆڤ لە بەر

تیشکی خۆر کە بـە شـێوەی بوورانـەوە و زیپکـە دەرکردن و یاو خۆی پیشان دەدا 🇮🇷 آفتابزدگی

**تاوانن** / tawanin/: ☜ **تواندنەوە**

**تاواننەوە** / tawannewe/: ☜ **تواندنەوە**

**تاوانەوە** / tawanewe/: ☜ **توانەوە**

**تاواوە** / tawawe/: ئاوەڵناو. قاڵ؛ تواوە 🇮🇷 ذوب‌شده

**تاوای** / taway/: چاوگ. تانین؛ تـوانین ‹دوو چـەم ئەر سەد ساڵ تەماشات کەران/ کەی تاوان سێر سەیر ئەو بالآت کەران؟ «سەیدی»› 🇮🇷 توانستن

**تاوبردو** / tawbirdû/: ☜ **تاوانگاز**

**تاوبردویی** / tawbirdûyî/: ☜ **تاوانگازی**

**تاوبردە** / tawbirde/: ☜ **تاوانگاز**

**تاوبە** / tawbe/: ☜ **تۆبە**

**تاوت** / tawit/: ☜ **تابووت**

**تاوتا** / tawta/: ☜ **تاکەوتاك**

**تاوتاف** / tawtaf/: ☜ **تافگە**

**تاو ـ تاو**[1] / taw taw/: ئاوەڵناو. بەین ـ بەین ‹هەی داد هەی بێداد دەردم تاو ـ تاوە/ سـیروان لـە بـەختم وشک و بێ‌ئاوە «فولکلۆر»› 🇮🇷 گهگاه

**تاو ـ تاو**[2]: ئاوەڵکار. بەین ـ بەین ‹باران ئەبارێ تاو ـ تاو/ ئەیدا لە زوڵفی حەلاو «فولکلۆر»› 🇮🇷 گهگاه

**تاوتـاوی** / tatawî/: ئاوەڵـناو. عەنتەرمـەزاج؛ سات‌ساتی؛ هەر تاوێ لە سەر بارێ 🇮🇷 دمدمی

**تاوتوێ** / tawt(i)wê/: ناو. ١. کزە و چووزی برین ٢. کـار و ڕەوتی لێکۆڵـینەوە؛ تۆژینـەوە 🇮🇷 ١. سوزش زخم ٢. تجزیە و تحلیل

⊡ **تـاوتوێ کـردن**: تۆژینـەوە؛ لێکۆڵـینەوە ‹هـۆی گـرانی و بێکـاری تـاوتوێ نـەکراوە› 🇮🇷 تجریـە و تحلیل کردن

**تاوتـو** / tawtû/: نـاو. هەڵگۆزـداگـۆز؛ کـاری گوازتنەوەی شت لە دەفرێکەوە بۆ یەکی‌تر یا لـە شوێنێکەوە بۆ شوێنی‌تر 🇮🇷 جابجایی

⊡ **تاوتـو کـردن**: گوازتنـەوە؛ گۆزینـەوە 🇮🇷 جابجـا کردن

**تـاوتێ** / ta w tê/: نـاو. یـاو و لـەرز؛ لـەرز و تـای نۆبەتی 🇮🇷 تب و لرز

**تـاودار** / tawdar/: ئاوەڵـناو. ١. بـە تـاو؛ پـڕتاو ٢. گەرم 🇮🇷 ١. پُرقُدرت ٢. گرم

**تـاوژین** / tawjîn/: چاوگ. خەریک بـوون؛ مـژوول بوون بە کارێکەوە 🇮🇷 مشغول بودن

**تـاوس** / taw(i)s/: نـاو. تـاووس؛ مـەلێکی وڵاتی هیندە، بەتایبەت نێرەکەی لە جوانیدا بەناوبانگـە 🇮🇷 تاووس

**تاوسان**[1] / tawsan/: ☜ **تاسان**

**تاوسان**[2]: ناو. هاوین؛ هامن؛ تاوسۆ؛ تاوسـوو؛ سـێ مانگەی پاش بەهار 🇮🇷 تابستان

**تاوسۆ** / tawso/: ☜ **تاوسان**[2]

**تاوسو** / tawsû/: ☜ **تاوسان**[2]

**تاوسە** / tawse/: مریشکی زەلکاو 🇮🇷 طاووسک

**تاوشت** / tawişt/: نـاو. هێـز؛ وزە؛ تاقـەت؛ تـوان؛ بڕشت؛ توانایی تێکۆشان و خۆڕاگری لە بەرامبـەر کاری دژوارەوە ‹گۆدەرز وات: ڕۆسـتەم کـەم بـدەر گەزاف/ نەداری تاوشت مەعرەکەی مەساف «شانامەی کوردی هەورامی»› 🇮🇷 تاب و توان

**تاوک** / tawik/: ☜ **تایلە**

**تاوکار** / tawkar/: نـاو. قاڵب‌ڕێژی کانزا. هەروەها: **تاوکاری** 🇮🇷 ریختەگر

**تاوکێش** / tawkêş/: ناو. پـەردە و تیغـەی داریـنی تەنک 🇮🇷 تیغەی نازک چوبی

**تاوگ** / tawig/: ☜ **تایلە**

**تـاوگر** / tawgir/: ئاوەڵـناو. بـەرتاو؛ تایبەتمەنـدی شوێنێ کە تاو لێی ئەدا 🇮🇷 آفتابگیر

**تاوگەز** / tawgez/: ☜ **تاوانگاز**

**تاولە** / tawle/: ناو. گژنیژ؛ گشنیز؛ تاوڵە؛ تاوڵێ 🇮🇷 گشنیز

**تاولەرز** / ta w lerz/: ناو. نۆبـەتێ؛ یـاو و لـەرزی

یەک لە دووی یەک ▤ تب نوبتی

**تاولەمە** / tawleme/: ناو. تابلەمە؛ تابلمە؛ تاولەمە؛ پۆل‌گەشێن؛ پەن‌چەرخێن؛ دەفری لە تۆڕی سیمی دروستکراو بە دەستەیەکەوە، خەڵووزی تێ دەکەن و گڕی دەدەن و دەیچەرخێنن تا بگەشێتەوە ▤ آتشگردان

**تاوڵ** / tawił/: ناو. خێوەت؛ چادر؛ ڕەشماڵ؛ کۆن ▤ چادر

**تاوڵە** / tawłe/: ناو. ١. ☜ **تەوێڵە** ٢. تاوڵێ؛ بەناڕۆمی؛ گژنیز؛ گشنیز؛ سەبزییەکی خۆراکییە، بە گوڵی چەتراسای پەمەیی یان سپییەوە، دژی سەرئێشە و کۆڵنج و گرسانی خوێنە ٣. تاوڵی؛ تەختەنەرد؛ تەختەی نەردێن ٤. پینگ‌پۆنگ؛ یاری تۆپی سەر مێز ▤ ١. ☜ **تەویلە** ٢. گشنیز ٣. تختەنرد ٤. پینگ‌پنگ

**تاوڵەکێفی** / tawłekêfî/: ناو. گژنیژە کێویلە ▤ گشنیز کوهی

**تاوڵەمە** / tawłeme/: ☜ **تاولەمە**

**تاوڵی** / tawłî/: ناو. تەختەنەرد ▤ تختەنرد

**تاوڵێ** / tawłê/: ناو. بەناڕۆمی؛ گژنیژ ▤ گشنیز

**تاونایەوە** / tawnayewe/: چاوگ. ١. تواندنەوە؛ تاواندنەوە ٢. تیشک لێ/ تێ گرتن ▤ ١. ذوب کردن ٢. تاباندن

**تاوننە** / tawinne/: ☜ **تاعون**

**تاووت** / tawut/: ☜ **تایلە**

**تاووس** / tawus/: ناو. ١. ☜ **تاوس** ٢. کفن؛ بەرگی مردوو ▤ ١. ☜ **تاوس** ٢. کفن

**تاووک** / tawuk/: ناو. خێوەت؛ ڕەشماڵ ▤ خیمە

**تاووگ** / tawug/: ☜ **تایلە**

**تاوە** / tawe/: ناو. تابە؛ تاویک؛ ماوڕێژ؛ ڕمبێژ؛ ڕوون‌بێژ؛ ڕوون‌پێژ؛ موریژ؛ ڕمپێشک؛ کەرسوون؛ کەرسون؛ ناوسنگانە؛ ناولنگان؛ ئاخلەوێک؛ ئاخلیفینک؛ ئاخلەویک؛ ئاغلەویک؛ ئاغلیک؛ مەنجەڵووکەی پەل، بۆ تێدا سوورکردنەوە ▤ تاوە

**تاوەتا** / taweta/: ☜ **تاکەوتاک**

**تاوەسوت** / tawesût/: ☜ **تاوانگاز**

**تاوەک** / tawek/: ☜ **تایلە**

**تاوەکو** / tawekû/: ئامراز. تاوەکی؛ تاکوو؛ تا ▤ تا

**تاوەکی** / tawekî/: ☜ **تاوەکو**

**تاوەگاز** / tawegaz/: ☜ **تاوانگاز**

**تاوەگەز** / tawgez/: ☜ **تاوانگاز**

**تاوەنگاز** / tawengaz/: ☜ **تاوانگاز**

**تاوەنگەز** / tawengez/: ☜ **تاوانگاز**

**تاوهەڵات** / tawhełat/: ناو. هۆربەشان؛ دەمی تاو کەوتن «تاوهەڵات بە چیا هەڵگەڕاین؛ ڕێگایەکی یەکجار سەخت و بەرداوی و دژوار بوو «هەژار، چێشتی مجێور»» ▤ زمان طلوع خورشید

**تاوی** / tawî/: ☜ **تایلە**

**تاویار** / tawyar/: ناو. تاوێرەدەنک؛ ئەوەندەی جارێک لە سێڵدا دەبرژێ ▤ مقدار دانەای کە یک بار در ساج بو دهند

**تاویاگەوە** / tawyagewe/: ئاوەڵناو. قاڵ؛ تاواوە؛ تواوە ▤ گداختە

**تاویان** / tawyan/: ☜ **تاویانەوە**

**تاویانەوە** / tawyanewe/: چاوگ. تاویان؛ تاوین؛ تاوینەوە؛ تاوانەوە؛ توانەوە؛ تاویایۆ: ١. لە گەرما ٢. لە تراوێکدا ▤ ١. ذوب شدن ٢. حل شدن

**تاویای** / tawyay/: ☜ **توانەوە**

**تاویایۆ** / tawyayo/: ☜ **تاویانەوە**

**تاویایەوە** / tawyayewe/: چاوگ. ١. توانەوە لە گەرمان ٢. توانەوە لە تراوێکدا ٣. تیشک لێ‌کەوتن ▤ ١. ذوب شدن ٢. حل شدن ٣. در معرض تابش قرار گرفتن

**تاویت** / tawît/: ☜ **تابووت**

**تاویک** / tawîk/: ☜ **تاوە**

**تاویلکە** / tawîlke/: ناو. تاوەی بچووک ▤ تاوەی

کوچک

**تاوین** / tawîn/: ☜ **تاویانەوە**

**تاوینەوە** / tawînewe/: ☜ **تاویانەوە**

**تاویەتی** / tawyetî/: ☜ **تایبەت**

**تاوێ** / tawê/: ئاوەڵکار. تاوێک؛ دەمێکی کەم ‹تاوێ لە هەیوان، تاوتاوێ لە ژوور/ ئەسووڕایەوە خەیلێ بە زەروور «قانع»› ☰ دمی؛ لحظەای

**تاوێر** / tawêr/: ناو. ١. ☜ **تاڤێر** ٢. ☜ **تمتمان**

**تاوێرەبەرد** / tawêreberd/: ناو. جارە؛ جاڵە؛ لاتار ☰ سنگ غلتان پرت شدە از کوە

**تاوێرەدەنک** / tawêredenik/: ☜ **تاویار**

**تاوێستاش** / tawêstaş/: ئاوەڵکار. هەڵە؛ هەتا ئێستاش ☰ تاکنون

**تاوێک** / tawêk/: ☜ **تاوێ**

**ـــ تاوێن** / tawên-/: پاشەوشە. ١. ئەوەی دەتاوێنێتەوە ‹گیانتاوێن› ٢. تاوێنەوە ‹قەنتاوێن› ☰ ١. ـ گُداز ٢. حل کنندە

**تاوێناتاوێ** / tawênatawê/: ئاوەڵکار. جارناجارێ؛ جاروبار ‹کەچی سەرباری ئەم هەموو دەردە/ تاوێناتاوێ پێم دەڵێ جەردە! «هەژار»› ☰ گاە و بیگاە

**تاوێنراو** / tawênraw/: ئاوەڵناو. هەڵنایا؛ تاواوە ☰ ذوبشدە

**ـ تاوێنەوە** / tawênewe-/: پاشەوشە. توێنەرەوە بە گەرمان ☰ گُدازندە

**تاهەتا** / taheta/: ئاوەڵناو. بێبڕانەوە؛ هەتاهەتایی ☰ جاویدان

**تایاخ** / tayax/: ناو. پێڵاو؛ کەوش ☰ کفش

**تایبەت** / taybet/: ئاوەڵناو. تابێتی؛ تاویەتی؛ تایبەتی؛ تایوەتی: ١. تایبەتمەند؛ گەوشت؛ تەرخانکراو بۆ شتێک ‹تایبەتی بار› ٢. بە دۆخ یان چۆنیەتییەکی تاقانە و بێهاوماڵەوە ‹فرۆکەی تایبەت؛ دۆخی تایبەت› ٣. نادەولەتی ‹نەخۆشخانەی کەرتی تایبەت› ٤ ☰ ١. ویژە ٢. اختصاصی ٣. خصوصی

**تایبەتمەند** / taybetmend/: ☜ **تایبەت-١**

**تایبەتمەندی** / taybetmendî/: ناو. گەوشین؛ دانستە؛ چۆنیەتی یان نیشانەی تایبەت بە کەس یان شتێک ‹گەرما، تایبەتمەندی ئاگرە› ☰ ویژگی

**تایبەتی** / taybetî/: ☜ **تایبەت**

**تایپ** / tayp/: ناو. پیتچنی؛ کاری نووسین بە مەکینە و کەمپیوتەر ☰ تایپ

**تایپیست** / taypîst/: ناو. پیتچن ☰ تایپیست

**تایچە** / tayçe/: ☜ **تاینچە**

**تایر** / tayir/: ☜ **تەگەرە -٢**

**تایفە** / tayfe/: ناو. تایەفە: ١. بنەماڵە؛ بەرەباب؛ سەرجەمی خزمان ٢. بەرە؛ تیرە؛ بەشێک لە خێڵ یان هۆز کە لە یەک شوێن و لەوەڕگە نیشتەجێ دەبن ☰ ١. خاندان ٢. طایفە

**تایفی** / tayfî/: ناو. تایەفی؛ جۆرێ ترێ ☰ نوعی انگور

**تایلە** / tayle/: ناو. تایلێ؛ تەیلە؛ تاوک؛ تاووگ؛ تاوەک؛ تاوگ؛ تاووت؛ تاوی؛ تیرەیەک داری زەلامی ناوچەی مەدیترانە و باکووری ئێران، بە گەڵای هێلکەیی، نووکتیژ و ددانەدار، گوڵی تاقی درێژ و بەری گۆشتن و میوەی وشکی خڕی ڕەش یان قاوەیی خۆراکییەوە ☰ داغداغان

**تایلێ** / taylê/: ☜ **تایلە**

**تایمێر** / taymêr/: ناو. کاتبژێر؛ ئامرازێک بۆ ڕاگرتن و ڕێخستنی کەرستەیەک لە کاتی دیاریکراودا ‹ئەم تەلەڤیزیۆنە تایمێری هەیە؟› ☰ تایمر

**تاین**[1] / tayn/: ناو. ڕەشکەی زلی کا کێشان ☰ توری بزرگ کاەکشی

**تاین**[2]: ئاوەڵناو. ناسراو؛ ئەوەی دەیناسین ‹کابرای تاین› ☰ شناختە شدە

**تاین**[٢]: جێناو. فلان؛ شتەکە؛ ئەوی خۆمان دەیزانین ‹ئەو تاینەکە هاتۆتەوە› ☰ یارو؛ فلان

**تاینچە / tayinçe/**: ناو. تایچە: ١. ڕەشکەی نیوە بار بۆ کا کێشان ٢. هۆڕ؛ جەوالی گەورە ☰ ١. توری کوچک کاەکشی ٢. جوال بزرگ

**تایوەتی / tayweti/**: ☜ تایبەت

**تایە / taye/**: ناو. ١. گیشە؛ گرشە؛ کوایەک لە هەر شتێ ٢. تایەن؛ مامان؛ لەلەی ژن ٣. نەمامە بی ناو چەم و چوغوڕ ☰ ١. درزە ٢. دایە ٣. نهال بید خودرو

**تایەفە / tayefe/**: ☜ تایفە

**تایەفی / tayefî/**: ☜ تایفی

**تایەلەلە / tayelele/**: ناو. لەلە؛ پیاوێ کە لە مالاندا ئاگای لە مندالان دەبوو ☰ لَلە

**تایەن / tayen/**: ناو. تایە؛ ماما؛ مامان؛ لەلەی ژن ☰ دایە

**تایهم / tayhim/**: دەنگ. وشەیەکە بە حەیران بێژی دەڵێن، واتا: ئافەریم، خۆشت گوت ☰ کلمەی تحسین خواننده

**تاییە / tayye/**: ئاوەڵناو. دڵمردوو؛ خۆپارێز ☰ دلمُردە

**تاییر / tayêr/**: ناو. قوو؛ دەجاجە؛ وێنەیەکی ئاسمانییە لە نیوەی باکووریی زەویدا ☰ صورت فلکی قو

**تبل / tib(i)l/**: ناو. تپل؛ قامک؛ تلی؛ تلهی؛ کلک؛ ئەنگوست؛ ئەنگۆس ☰ انگشت

▣ **تبلا بەرانێ**: قامکەگەورە ☰ انگشت شست

**تبلا ڕۆخێ**: براتووتە ☰ بِنصِر

**تبلا قچیلکە**: تووتە؛ تلیا گچکە ☰ انگشت کوچک

**تبلا گچکە**: تووتە؛ گیشتا قلینج ☰ خنصر؛ انگشت کوچکە

**تبلا مەزن**: قامکەگەورە ☰ انگشت شست

**تبلا نێوەکێ**: زەڕنەقووتە؛ تلیا ناوی ☰ انگشت وسط

**تبلچاف / tib(i)lçav/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ئەنگوستەچاو؛ زۆر تاریک ☰ بسیار تاریک

**تبلک / tiblik/**: ناو. قووچەکە؛ ئەنگوستیلەی دروومانان ☰ انگشتانە

**تبلیا / tibl(i)ya/**: ناو. قلینجک؛ تووتە؛ ئەنگوستەچکۆلە ☰ خنصر؛ انگشت کوچک

**تبوق / t(i)bûq/**: ☜ لەتر

**تپکە / tipke/**: ناو. پلتۆک؛ پیتکە ☰ تلنگُر

**تپل / t(i)pil/**: ☜ تبل

**تپین / t(i)pên/**: ناو. شلەنگ؛ شیلانگ ☰ شیلنگ

**تجەنەڕ / t(i)ceneř/**: ☜ تەجە

**تخ / tix/**: دەنگ. وشەی پارازتن، واتا: نەکەی ☰ کلمەی تحذیر

**تخل / tixil/**: ئاوەڵناو. خوێڕی؛ بێکارە؛ بێنرخ و هەرزە ☰ لش؛ بیکارە

**تخوب / t(i)xub/**: ☜ تخووب

**تخوم / t(i)xum/**: ☜ تخووب

**تخون / t(i)xun/**: ☜ توخن[٢]

**تخووب / t(i)xûb/**: ناو. سنوور؛ کەوشەن؛ تخووم؛ تخوب؛ تخوم؛ تغووب؛ توخوب؛ توخیب؛ تالخ ☰ مرز

**تخووم / t(i)xûm/**: ☜ تخووب

**تخوون / t(i)xûn/**: ئامراز. توخن؛ توخوون؛ نێزیکی ☰ طرفِ؛ نزدیکِ

⊡ **تخوون کەوتن**: نزیک بوونەوە؛ بە لادا چوون ‹تخوون ئاگر نەکەوی!› ☰ نزدیک شدن

**تخێل / t(i)xêl/**: ئاوەڵناو. خومام ☰ دراز کشیدە

**تخێڵ / t(i)xêł/**: ئاوەڵناو. ڕەهێڵ؛ بە سەر زەویدا پانەوە بوو ☰ ولو؛ پخش زمین

**تر**[١] **/ tir/**: ئاوەڵناو. ١. دیتر؛ دیکە؛ دن؛ تەر ‹کاریکی تر› ٢. تور؛ زوانبەگیر؛ تایبەتمەندی کەسێ کە قسەی باش بۆ ناکرێ ☰ ١. دیگر ٢.

الکن

**ـ تــر**[2]: پاشــگر. نیشــانەی ئاوەڵــناوی هەڤــیازی ‹خۆش‌تر؛ جوان‌تر؛ سەرتر› ☰ ـ تَر؛ نشـانەی صـفت تفضیلی

**ترات** / t(i)rat/: ☜ **تراتێن**

**تــراتین** / t(i)ratîn/: نــاو. هــاتوچــووی شــتی هەڵواسراو وەک جووڵانەوەی جۆلانە ☰ نوسان

**تراتێن** / t(i)ratên/: ناو. تـرات؛ تریتـان؛ تریتانـێ؛ ڕمبازی بە ئەسپ؛ هاتوچووی سوار لە مەیدانـدا ☰ جَولان سوارکار در میدان

**تــرار** / t(i)rar/: نــاو. ترگــار؛ تاســوولکەی ئــاو خواردنەوە ☰ ظرف کوچک آبخوری

**ترارک** / t(i)rarik/: ناو. کاسە؛ تاس؛ قاپ ☰ کاسە

**تراز**[1] / t(i)raz/: ناو. ۱. تەراز؛ دەڤە؛ ڕاستەی بـەنا؛ ئــامرازێکی بــەنایی ۲. *[حیــابداری]* ڕێکــار؛ هاوسەنگیی نێوان ڕیزی قەرزداری و قەرزدەری و هەروەها جیاوازی ئەو دوانە لە دەفتەرێکیماڵیدا ۳. جەڕ و مەنگەنە ☰ ۱. تراز بنایی ۲. تراز مـالی ۳. شکنجە

**تراز**[2]: ئاوەڵناو. ۱. تەخت ‹کەفی دیوەکە تراز نییـە› ۲. ڕێک‌بەڕێک ‹ئەو دوو مێزە پێکەوە تراز کـە!› ☰ ۱. مسطح ۲. هم‌سطح

**ترازان** / t(i)razan/: چاوگ. ترازیان؛ ترازیـای: ۱. لێک کلابوون؛ جیا بوونەوە ‹دوگمەی سەر سینەی بـەیان تـرازا/ بـەیان بـە گوڵـی سـپی و سـوور ڕازا «پیرەمێرد»› ۲. دەرچوون؛ دەرپـەڕین ۳. لـەجێ چوون ‹جومگە ترازان› ٤. لادان ‹مـرۆی بـاش لـە ڕێبازی ژیاندا لە هێڵی دروستی ناترازێ› ☰ ۱. از هم وا شدن ۲. دررفتن ۳. از جا دررفتن ۴. مُنحرف شدن

**ترازانـدن** / t(i)razandin/: چاوگ. لـە یـەک جیـا کردنەوە ☰ از هم وا کردن

**تــرازاو** / t(i)razaw/: ئاوەڵــناو. وەکــری؛ لێــک دەرپەڕیو ☰ از هم وا شدە

**ترازنای** / t(i)raznay/: چـاوگ. ترازاندن ☰ از هـم وا کردن

**ترازو** / t(i)razû/: ناو. تەرازوو؛ تەرازی؛ ترازی: ۱. شەهین؛ شەهێن؛ ئـامرازی کێشـان و کـێش بـە سـەنگ کـردن ۲. کۆمەڵــە ئەســتێرەیەکە لــە ئاسمان ☰ ۱. ترازو ۲. بُرج میزان

**ترازوباز** / t(i)razûbaz/: ئاوەڵناو. سـووکـفـرۆش؛ کەم‌فرۆش ☰ کم‌فروش

**ترازی** / t(i)razî/: ☜ **ترازو**

**ترازیان** / t(i)razyan/: ☜ **ترازان**

**ترازیای** / t(i)razyay/: ☜ **ترازان**

**تراژیــدیا** / t(i)rajêd(i)ya/: نــاو. ۱. خەمنامــە؛ سۆزنامە؛ جۆرێ شانۆ یا فیلمنامە کە تێیدا هەوڵ و تـەقالای قارەمانـان بـە چەشـنی ناچارەسـەر، دەبێتـە هـۆی پێکهـاتنی ئاکـامێکی دڵـتەزێن و نـاخۆش ‹تراژیـدیای مـەم و زیـن› ۲. کارەسـات؛ ڕووداوی ئێجگار دڵتەزێن ☰ ۱و۲. تراژدی

**تراست** / t(i)rast/: نـاو. یەکیــەتی نێــوان چەنـد بنکــەی پیشەســازی یــان ئــابووری بــۆ کــەم کردنەوەی ڕکابەری و نرخ دانـانی بـە ئیشـتیا ☰ تراست

**تراسکە** / t(i)raske/: نـاو. ڕەوتی لــە ڕێ لادانی بارەبەر ☰ انحراف باربر از راه

**تراش**[1] / t(i)raş/: ناو. ۱. کاری بە تـیخ پەڕانـدن و قرتاندن ۲. کاری تاشین و ساف کـردنی سـەر و ڕیش ☰ ۱. تراش ۲. اصلاح (سر و صورت)

**ـ تراش**[2]: پاشەوشە. ـ تاش ‹چێوتراش؛ سەنگـتـراش› ☰ ـ تراش

**تراشــران** / t(i)raşran/: چــاوگ. تێنەپــەڕ. نادیــار. //تراشرای؛ دەتراشرێی؛ بتراشرێ// تاشیان؛ کـریان؛ ڕەوتان ☰ تراشیدە شدن

■ ئاوەڵــناوی بــەرکاری: تراشــراو/ چـاوگی نـەرێنی: نەتراشران

**تراشراو** / t(i)raşraw/: ئاوەڵناو. پاخلێر؛ تاشـراو ⇐ تراشیده

**تراشە** / t(i)raşe/: نـاو. ١. کـاری تاشـین ٢. ☜ تۆلاش ⇐ ١. تراش ٢. ☜ تۆلاش

**- تراشی** / t(i)raşî-/: پاشگر. ـ تاشـی ‹چێوتراشـی› ⇐ ـ تراشی

**تراشیان** / t(i)raşyan/: ☜ تاشران

**تراشین** / t(i)raşîn/: ☜ تاشین

**ترافـانن** / t(i)rafanin/: چـاوگ. ١. ڕفانـــدن ٢. ڕەواندن ⇐ ١. ربودن ٢. رم دادن

**ترافیاگ** / t(i)rafyag/: ☜ ترافیە

**ترافیک** / t(i)rafîk/: نـاو. ١. هاتوچۆ؛ هاتوچـوو؛ ئـاموشـۆ؛ ئامـەولوەی؛ هـاتوچـۆی ئامێرەکـانی گواســتنەوە لــە شــەقام و جــادە ٢. شــلۆقی؛ قەرەباڵغی؛ جەنجاڵی؛ چڕ و پڕی لە هاتوچـوودا ‹دوێشەو لە نێـو ترافیکـدا گیرمـان خـوارد› ⇐ ١و٢. ترافیک

**ترافیە** / t(i)raf(i)ye/: ئاوەڵناو. ترافیـاگ؛ تراڤـیە؛ دەرکراو؛ و دوورەوەکراو ⇐ رانده شده؛ طردشده

**تراڤیە** / t(i)rav(i)ye/: ☜ ترافیە

**تراک** / t(i)rak/: ناو. دەوری؛ قاپی پەل ⇐ بُشقاب

**تراکتۆر** / t(i)raktor/: ☜ تەراکتۆر

**تراکخۆر** / t(i)rakxor/: ☜ تریاکی

**ترانزیـــت** / t(i)ranzît/: نـــاو. کــــــار و ڕەوتی پەڕینەوەی ڕێبوار، شتومەک و ... لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکیتر ⇐ ترانزیت

**ترانس** / t(i)rans/: ☜ ترانسفورماتۆر

**ترانسفورماتۆر** / t(i)ransfurmator/: نـاو. تـرانس؛ ئامێرێکی کارەبایی بۆ کەم یان زۆر کردنی وزەی کارەبا ⇐ ترانسفورماتور

**تراو**[1] / t(i)raw/: ناو. تەوش ⇐ مایع

**تراو**[2]: ئاوەڵناو. شل؛ تەڕ ⇐ آبکی

**تـراوری** / t(i)raw(i)rî/: ناو. گیاندار؛ ژی؛ جانـەوەر ⇐ جاندار

**تراوکـە** / t(i)rawke/: نـاو. ١. جـــۆرێ بـــەردی بریقـەدار و تـەنک ٢. ☜ تراویلکـە ⇐ ١. نـوعی سنگ نازک و صاف ٢. ☜ تراویلکە

**تراویلکـــە** / t(i)rawîlke/: نـــاو. تراوکـــــە؛ بەردەتراویلکـــە؛ بەردەتراوکـــە؛ بەردەڕێژگـــە؛ بەردەترۆق؛ ڕەوڕەوک؛ هاڵ؛ لـەیلان؛ ڕەو ـــ ڕەو؛ پەپەرک؛ ئاونما؛ دیاردەیـەکی کەشـی بـە هـۆی تیشکدانەوەی نـوور لـە سـەر تـوێژێکی هـەوای گەرمدا، کە دیمەنێکی وەک ئاو بـەدی دێنـێ ⇐ سراب

**ترب** / tirb/: ناو. قەبر؛ قەور؛ گۆڕ ⇐ قبر

**تربێ** / tirbê/: نـاو. شـەوی ناوەڕاسـتی زسـتان؛ شەوی چل و پێنجەمی زۆسـان ⇐ شـب میانـەی زمستان

**ترپ**[1] / tirp/: ناو. ١. ☜ تورـ١ ٢. تـرب؛ قـەبر؛ قەور؛ گۆڕ ⇐ ١. ☜ تورـ١ ٢. قبر

**ترپ**[2]: دەنگ. دەنگی کەوتنی شتی نەرم و قورس ⇐ صدای افتادن شیئ نرم و سنگین

**ترپاس** / tirpas/: ☜ تلْفار

**ترپـان** / tirpan/: نـاو. مەڵـــەغان؛ کـــەرەمتوو؛ داسکەرەنتوو؛ داسی درێژی دسکدار کە بە پێـوە پێی دەدروون ⇐ داس بلند دستەدار

**ترپچە** / t(i)ripçe/: ناو. شیمێ؛ تـوورە سـوورە ⇐ تُرُبچەی قرمز

**ترپۆکە** / tirpoke/: نـاو. ١. گیایەکـە بـۆ دەقـی کووتاڵ بە کار دێت ٢. شێلم؛ شەلەم ⇐ ١. شلمک ٢. شلغم

**ترپە** / tirpe/: دەنگەناو. دەنگی کـەوتنی گـران و پانبەپانی شـتان ‹گـوێم عـەزرەتی ترپـەی پێتـە/ هەمیشە ئاراستەی ڕێتە «گۆران»› ⇐ گرمب

**ترپەترپ** / tirpetirp/: دەنگەناو. دەنگی کـەوتنی یەک لـە دوو یـەکی شـتانی نـەرم و قـورس ⇐

گرمب ـ گرمب

**ترت**[1] / tirt/: ناو. سەرپەنجە؛ سەری قامک 🇮🇷 سر انگشت

**ترت**[2]: ئاوەڵناو. تورت 🇮🇷 تُرد

**ترتول / tirtul/**: ناو. شۆبە؛ شۆکە؛ شەتە 🇮🇷 شتەی درخت

**ترچک / tirçik/**: ناو. گیاگوڵەنگ؛ گیاماران؛ مارچێوە 🇮🇷 مارچوبە

**ترخن / tirxin/**: ئاوەڵناو. ١. زۆرخۆر؛ فرەخۆر ٢. ناوچاوتاڵ؛ مڕ و مۆن 🇮🇷 ١. پُرخور ٢. تُرشرو

**ترخە / tirxe/**: ناو. چۆنیەتی تێکچوونی دڵ و هەناو لە بەر زۆرخۆری 🇮🇷 امتلای معده

**ترخێنە / tirxêne/**: ناو. ١. شەلەمین؛ شەلەم؛ چێشتی شێلم و دان ‹ترخێنە تا بمێنێتەوە پرگ هەڵدێنێ «مەسەل»› ٢. پیسایی شلی منداڵ 🇮🇷 ١. ترخینە؛ آبکامە ٢. مدفوع آبکی کودک

**ترس**[1] / tirs/: ناو. ١. تەرس؛ تەرسی؛ سام؛ سامی؛ سیم؛ یاس؛ سوهن؛ ساو؛ هاس؛ هەراس؛ باک؛ زەرتەلاق؛ سەیشت؛ پەرێ؛ ڕخ؛ خەزە؛ قورف؛ چورچ؛ چرچ؛ چیق؛ تاو؛ زیەلە؛ زیەلێ؛ زوویەلە؛ زیەلگ؛ زار؛ زراو؛ زاور؛ تناب؛ هەستێ کە لە مەترسیدا سەر هەڵدەدا ‹ترس، لە بەر نەزانینە «مەسەل»› ٢. فێ؛ پەرکەم؛ نەخۆشی خووداری ٣. قەڵغان؛ سپەر ٤. دڵگرانی؛ دڵخورتی ‹ترسی ناڵەکانت نەبێ، لە لای منن› 🇮🇷 ١. ترس ٢. صرع ٣. سپر ۴. نگرانی

⊡ **ترس بون:** ترسان ‹ترسمان لە کەس نییە› 🇮🇷 ترس داشتن

**ترس داگرتن:** خۆف کردن؛ سام گرتن ‹لە تاو جەندەرمە ترس دایگرتین› 🇮🇷 ترس برداشتن

**ترس سواری کەسێک بون:** کەسێک تووشی سام و ترس بوون 🇮🇷 ترس بر کسی مستولی شدن

**ترس شکان:** نەمانی ترس 🇮🇷 ترس ریختن

**ترس کەوتنە دڵ:** ترسان. هەروەها: **ترس خستنە دڵ** 🇮🇷 ترسیدن

**ترس لێشکان:** وە غیرەت کەوتن لە بەرامبەر جێمەترسیدا 🇮🇷 شهامت یافتن

**ترس لێنیشتن:** تووشی ترس هاتن 🇮🇷 ترس برداشتن

**ترس نانە بەر:** ترساندن 🇮🇷 ترساندن

▪ **ترس**[2]: پاشەوشە. ترساو ‹خواترس› 🇮🇷 ـ ترس

**ترسان / tirsan/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //ترسای؛ دەترسی؛ بترسە// ترسیان؛ ترسین: ١. نەوێران ‹بپرسە حاڵم ئیلهامی وەفا بەس/ بترسە تۆ لە حەق، جەور و جەفا بەس! «مەحوی»› ٢. *[مەجاز]* ژان کردن یان لە کار کەوتنی ئەندامێکی لەش بۆ ماوەیەکی کەم کە مەترسی لە سەر نەبێ ‹پای نەشکاوە، هەر ترساوە› 🇮🇷 ١. ترسیدن ٢. بە درد آمدن و از کار افتادن موقتی عضو

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ترساو/ چاوگی نەرێنی: نەترسان

**ترساندن / tirsandin/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //ترساندت؛ دەترسێنی؛ بترسێنە// ترسانن؛ ترس وەبەر نان 🇮🇷 ترساندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ترسێندراو/ چاوگی نەرێنی: نەترساندن

**ترساندنەوە / tirsand(i)newe/**: چاوگ. قەبزداندن 🇮🇷 بازترساندن

**ترسانن / tirsanin/**: ☜ **ترساندن**

**ترساو / tirsaw/**: ئاوەڵناو. ترسیاو: ١. تووشی ترس و خۆفهاتوو ٢. *[مەجاز]* ئێش پێگەیشتووی هیچ لێ نەهاتوو 🇮🇷 ١. ترسیدە ٢. ویژگی عضو بە درد آمدە و موقتا از کار افتادە

**ترسناک / tirsnak/**: ئاوەڵناو. سامناک؛ بەسام؛ زاتبەر؛ بە ترس؛ بە مەترسی؛ بە خۆف 🇮🇷 ترسناک

**ترسنۆک / tirs(i)nok/**: ئاوەڵناو. ترسۆک؛

ترسـۆنەک؛ تەرسـۆنەک؛ ترسـەنۆک؛ ترسـەزاڵ؛ ترسەزاور؛ ڕەڤڕەڤـۆک؛ بێجـەرگ؛ قـزە؛ بـێزات؛ بێزاور؛ خنـز؛ خیز؛ بزدونەک؛ دڵـزراڤ؛ گـەوش؛ نەوێر؛ چاڤسست؛ کەلەزات؛ کەللەزراو؛ کەلەزراو؛ کـاوجوورەت؛ کەوێزلـگ؛ کـەوجورەت؛ ڕخـوو؛ حیـزەڵ؛ حیزەڵـە؛ قەرچالـە؛ قرچالـە؛ مێچـک؛ دلچیچک؛ نەوێرۆک؛ بێـوەر؛ بێـورە؛ قەڵـسەمێر؛ تەرسـەزاڵ؛ بـێتشـک؛ کـەوڕخ؛ کەوزوویەڵـە؛ میەدل؛ مییەدڵ ‹ترسـنۆک ڕۆژێ دەجـار دەمرێ، ئازا لە ژیاندا جارێ «مەسەل»› ⊑ ترسو

**ترس و لەرز** / tirs û lerz/: ناو. ترسی زۆر ⊑ ترس و لرز

**ترسۆک** / tirsok/: ☜ **ترسنۆک**

**ترسۆنەک** / tirsonek/: ☜ **ترسنۆک**

**ترسونەکی** / tirsûnekî/: ☜ **ترسەنۆکی**

**ترسەترس**[1] / tirsetirs/: ناو. دۆخی بە ئـاژاوە و پـڕ لە مەترسی ⊑ وضع ناآرام و پُرخطر

**ترسەترس**[2]: ئاوەڵـکار. تێکـەڵاوی خـۆف و تـرس ‹ترسەترس چووە پێشەوە› ⊑ ترسان ـ ترسان

**ترسەزاڵ** / tirsezał/: ☜ **ترسنۆک**

**ترسەزاور** / tirsezawir/: ☜ **ترسنۆک**

**ترسەزاوەر** / tirsezawer/: ئاوەڵـناو. قـزە؛ قەڵـس؛ نەوێر ⊑ ترسو

**ترسەنۆک** / tirsenok/: ☜ **ترسنۆک**

**ترسەنۆکانە** / tirsenokane/: ئاوەڵـناو. حیزانـە ⊑ بُزدلانە

**ترسەنۆکی** / tirsenokî/: نـاو. حیـزاتی؛ هیـزاتی؛ ترسوونەکی ⊑ بُزدلی

**ترسی** / tirsî/: ئاوەڵناو. تسی: ١. پـەتی؛ ڕووت (بـۆ نان دەگوترێ) ٢. وشک (بۆ نان) ⊑ ١. خـالی (نـان) ٢. خشک و خالی (نان)

**ترسیان** / tirsyan/: ☜ **ترسان**

**ترسیاو** / tirs(i)yaw/: ☜ **ترساو**

**ترسین** / tirsîn/: ☜ **ترسان**

• **ترسێن** / tirsên-/: پاشەوشە. ئەوەی تـرس وە بـەر بێنێ ‹بەچەترسێن؛ چاوترسێن› ⊑ ترساننده

**ترسێنران** / tirsênran/: چـاوگ. تێنەپـەڕ. نادیـار. //ترسـێنرای؛ دەترسـێنرێی؛ بترسـێنرێ// ترسـانن؛ ترس وەبەر نان ⊑ ترساندن

■ ئاوەڵناوی بـەرکاری: ترسـێنراو/ چاوگی نـەرێنی: نەترسێنران

**ترش**[1] / tirş/: نـاو. تـورش: ١. سمـاق ٢. *[مەجاز]* گرژیی دەم و چـاو ٣. *[مەجاز]* ترشـی؛ ناخۆشـی؛ تاڵی ‹ترش و شیرینی ڕۆژگـارم زۆر چەشـتووە› ٤. ئەسید؛ تیزاو؛ هەر ماکێکی کیمیایی کە لە ئـاودا $H^+$ بـەدی بێنـێ ⊑ ١. سُماق ٢. اخـم ٣. سـختی؛ دشواری ۴. اسید

**ترش**[2]: ئاوەڵناو. تورش: ١. یەکێک لە چوار چێـژی سەرەکی؛ بە چێژی دەمکۆوەکەرەوە ٢. تاڵ؛ گرژ و مۆن ⊑ ١. تُرش ٢. اخمو

**ترشان** / tirşan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //ترشای؛ دەترشێی بترشە// تورشیان؛ ترشیان؛ تشیای: ١. هەڵگەڕان؛ چێژ ترش بـوون ٢. هەڵـگەڕان؛ گـەنین؛ خـراپ بوون ٣. *[مەجاز]* قەیرە بوون؛ لادانی تەمـەنی کـچ لە شـوو کـردن ⊑ ١. تُرشـیدن ٢. فاسـد شـدن ٣. گذشتن سن دختر مجرد از سن ازدواج

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: ترشـاو/ چـاوگی نـەرێنی: نەترشان

**ترشاندن** / tirşandin/: چاوگ. تێـەڕ. //ترشـاندت؛ دەترشـێنی؛ بترشـێنە// ترشـانن؛ تورشـاندن؛ ترشگیانن؛ تشنای: ١. ترش هەڵگێڕان ٢. *[مەجاز]* ڕوو گرژ کـردن ‹هـەر نـاوی خوێنـدنی لـێ ببـەی ئەیتورشێنێ!› ⊑ ١. تُرشاندن ٢. اخم کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەترشاندن

**ترشانن** / tirşanin/: ☜ **ترشاندن**

**ترشاو**[1] / tirşaw/: ناو. تورشاو: ١. ئاوی چێژە ترش

۲. چێشـتێکی ئـاوەکی کـە تـرش و ڕشـتە و دانەوێڵەی تێدایە ☷ ۱. تُرشاب ۲. نوعی آش تُرش

**ترشاو**[۲]: ئاوەڵناو. تورشاو؛ ترشگیاگ؛ تورشیاگ؛ تورشیاو: ۱. باری شتێک کە بە هۆی مانەوەوە ترش هەڵگەڕابێ ۲. گەنیو؛ خراپبوو ۳. [مەجاز] ڕووگرژ؛ مڕومۆن ☷ ۱. تُرشیده ۲. فاسدشده ۳. اخمو

**ترشتە** / /t(i)rişte/: ☜ **تەشوێ**

**ترشقە** / /t(i)rişqe/: ناو. برووسکەی ئاسمان ☷ آذرخش

**ترشک** / /tirşik/: ☜ **ترشۆکە**

**ترشکە** / /tirşke/: ☜ **ترشۆکە**

**ترشکی** / /tirşkî/: ☜ **ترشۆکە**

**ترشکێ** / /tirşkê/: ☜ **ترشۆکە**

**ترشگیاگ** / /tir(i)şg(i)yag/: ☜ **ترشاو**[۲]

**ترشگیانن** / /tir(i)şg(i)yanin/: ☜ **ترشاندن**

**ترشوتاڵ** / /tirş û tał/: ئاوەڵناو. [مەجاز] ڕووگرژی ڕەزاگران ☷ اخموی گرانجان

**ترشوتەلاش** / /tirş û tełaş/: ناو. ترشوچەوەندەر؛ شیوی چەوەندەر و سماق ☷ آش چغندر و سماق

**ترشوشیرن** / /tirş û şîrin/: ☜ **ترشوشیرین**

**ترشوشیرین** / /tirş û şîrîn/: ئاوەڵناو. ترشوشیرن: ۱. مێخۆش ۲. [مەجاز] خاسوخراو؛ خۆشی و ناخۆشی؛ سەختی و ڕاحەتی ☷ ۱. مَلَس ۲. خوب‌وبد

**ترشۆک** / /tirşok/: ☜ **ترشۆکە**

**ترشۆکە** / /tirşoke/: ناو. ترشکە؛ ترشۆک؛ ترشەکە؛ تروشکە؛ تریشکە؛ تورشکە؛ تورشێنەک؛ ترشێنک؛ تورشیکە؛ ترشک؛ ترشکی؛ ترشکێ؛ تووشکە؛ تورێشکە؛ تێرشک؛ بەرەسماق؛ سیچک؛ سیچکی؛ سیچکە؛ گیاییکی چەندساڵەیە لە تیرەی ڕێواس، بنێکی ئەستووری هەیە، بۆ دەرمان دەشێ ☷ تُرشَک

**ترشۆکەخاتوون** / /tirşokexatûn/: ناو. ترشۆکەخاسە؛ ترشەخاتوون؛ جۆرێ ترشۆکەی ناسک و گەلاپانە بۆ دۆکلیو دەبێ ☷ نوعی ترشک

**ترشۆکەخاسە** / /tirşokexase/: ☜ **ترشۆکەخاتوون**

**ترشەخاتوون** / /tirşexatûn/: ☜ **ترشۆکەخاتوون**

**ترشەکشمیش** / /tirşekişmîş/: ناو. سەرچک؛ کشمیشە کەوڵی ☷ زرشک

**ترشەکە** / /tirşeke/: ☜ **ترشۆکە**

**ترشەڵۆک** / /tirşełok/: ئاوەڵناو. ترشاوی کەفکردووی خراوبوو ☷ تُرشیده و فاسد شده

**ترشەمەنی** / /tirşemenî/: ☜ **ترشیات**

**ترشی** / /tirşî/: ناو. ۱. دۆخ یان چۆنیەتی تورش بوون ‹ترشییەکەی زۆرە› ۲. یەکێ لە چوار تامی سەرەکی کە مرۆ بە پرزەی زمانی هەستی پێ دەکا (وەک تامی سرکە) ۳. ☜ **ترشیات** ☷ ۱. تُرشی ۲. تُرش مزگی ۳. ☜ **ترشیات**

▣ **ترشی گرتنەوە** دروست کردنی ترشی لە میوە یان سەوزی ☷ ترشی انداختن

**ترشیات** / /tirş(i)yat/: ناو. ترشی؛ ترشەمەنی؛ تورشیات؛ بەرهەمێکی خواردەمەنییە لە سەوزی و میوەی پەروەردەکراو لە سرکەدا، کە زۆرتر لە ناو ژەم و لەگەڵ چێشتدا دەخورێت ☷ تُرشی

**ترشیان** / /tirş(i)yan/: ☜ **ترشان**

**ترشێنک** / /tirşênik/: ☜ **ترشۆکە**

**ترشێنە** / /tirşêne/: ناو. هەویرترش ☷ خمیرمایه

**ترغەل** / /tirğel/: ئاوەڵناو. شلوشەویق؛ خۆنەگرتوو ☷ شُل

**ترفاڵ** / /tirfał/: ناو. تلپی دانەی ڕۆن لێگیراو ☷ کُنجاله

**ترقە** / /tirqe/: دەنگەناو. حیلکە؛ تریقەی بەرز؛ دەنگی بەرزی پێکەنین ☷ قهقهه

**ترک** / /tirk/: ناو. تورک: ۱. نژاد و ڕەگەزێکی ئاسیایی ۲. هەرکام لەو کەسانەی کە زمانی زگماکیان ترکییە ۳. خەڵکی وڵاتی تورکیا ☷

۱تا۳. تُرک

**ترکانه / tirkane/**: ناو. هەوایەکی گـۆرانی کـۆنی کوردانەیە 🇮🇷 از آهنگ‌های قدیمی کُردی

**ترکانی / tirkanî/**: ناو. جۆرێ هەڵپەرکێ 🇮🇷 نوعی رقص گروهی

**ترکزه / tirk(i)ze/**: ناو. ۱. دڵـەڕاوکێ ۲. گێـژەن؛ تۆکز؛ گێچەڵ ۳. خەتەر؛ بڤە ٤. تەپکە؛ تەڵـە 🇮🇷 ۱. اضطراب ۲. پاپوش ۳. خطر ۴. تله؛ دام

**ترکژۆک / tirk(i)jok/**: ☜ **تەرزە**

**ترکەش / tirkeş/**: ناو. خاڵیگە؛ خالیە؛ تەنشـت 🇮🇷 تُهیگاه؛ پهلو

**ترکی[۱] / tirkî/**: نـاو. تـورکی؛ هـەرکام لـە دەسـتە زمانگەلی سـەر بـە ناوچـەی ئاسـیای نـاوین لـە زمانەکانی ئۆراڵ ـ ئاڵتایی 🇮🇷 تُرکی

**ترکی[۲]**: ئاوەڵـناو. تورکی؛ سەر بە ترک؛ پێوەندیـدار بە ترکەوە ‹چێشتی ترکی› 🇮🇷 تُرکی

**ترگـار / tirgar/**: نـاو. تــرار؛ تاســوولکەی ئـــاو خواردنەوە 🇮🇷 تاسک آبخوری

**ترگژۆک / tirg(i)jok/**: ☜ **تەرزە**

**ترماسک / tirmasik/**: ☜ **تیزماڵك**

**ترمسک / tirmisk/**: ☜ **تیزماڵك**

**تـرنج / tirinc/**: نـاو. کـەبات؛ باروونـە؛ بالنـگ؛ میوەیەکە لە تیرەی نارنج و پرتەقاڵ 🇮🇷 بالنگ

**ترنجـان / t(i)rincan/**: چـاوگ. تێنەپـەڕ. //ترنجـای؛ دەترنجێی؛ بترنجە// چوونە نـاو شـتێ بـە گێـرە و زەحمەت 🇮🇷 چپیدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: ترنجـاو/ چـاوگی نـەرێنی: نەترنجان

**ترنجانــدن / t(i)rincandin/**: چــاوگ. تێـــەڕ. //ترنجاندت؛ دەترنجێنی؛ بترنجێنە// ترنجـانن؛ بـە زۆر خستنە ناو 🇮🇷 چپاندن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: ــــ/ چـاوگی نـەرێنی: نەترنجاندن

**ترنجانن / t(i)rincanin/**: ☜ **ترنجاندن**

**ترنجۆک / t(i)rincok/**: ناو. گیایەکـە بـۆنی نـارنج دەدا 🇮🇷 گیاهی با بوی نارنج

**ترنجو / t(i)rincû/**: ناو. تیخی تیژ 🇮🇷 تیغ تیز

**ترنجـە / t(i)rince/**: نـاو. پەیـنجـە؛ نـەردیوان 🇮🇷 نردبام

**ترنجــەبین / t(i)rincebîn/**: نـــاو. ترنجـــەمین؛ دەرمانێکە لە گیا و دڕووی وشترخۆرە ساز دەبـێ 🇮🇷 ترنگبین

**ترنجەمین / t(i)rincemîn/**: ☜ **ترنجەبین**

**ترنجیان / t(i)rinc(i)yan/**: چـاوگ. ۱. بە هێم لـە ناو دوو لای شـتێکدا گـیر کـردن ۲. قرینجیـان؛ قرنجیان؛ شکان یان بریندار بوونی کەم 🇮🇷 ۱. گیر کردن لای چیزی ۲. زخم برداشتن

**ترنگ / t(i)ring/**: نـاو. ۱. پایـە؛ دەرەجـە؛ پلـە ۲. پلتۆک؛ پتە؛ پتکە؛ پیتکە 🇮🇷 ۱. رتبه ۲. تلنگُر

**ترنگانـدن / tir(i)ngandin/**: چاوگ. لنگ دان؛ غار دان ‹بە ئەسپەکوێنەوە ترنگاندی› 🇮🇷 تاختن

**ترنگە[۱] / t(i)ringe/**: ناو. پتە؛ پلتۆک 🇮🇷 تلنگُر

**ترنگە[۲]**: دەنگەناو. دەنگی وێـکـکـەوتنی زێـو یـان کانزای‌تر 🇮🇷 جرینگ؛ صدای بهم خوردن فلزات

**تـرنگین / t(i)ringîn/**: چـاوگ. دەنـگ دانــەوە؛ گەڕانەوەی دەنگ 🇮🇷 طنین افتادن

**ترنوسقاو / tirnûsqaw/**: نـاو. زەردایـی چـەوری گۆشـت لـە سـەر ئـاوی شـۆربا 🇮🇷 چربـی سـطح آبگوشت

**ترنیت / tirnît/**: ☜ **ترنیسك**

**ترنیسق / tirnîsq/**: ☜ **ترنیسك**

**ترنیسک / tirnîsk/**: ناو. ترنیت؛ ترنیسق؛ یاکـەریم؛ کۆترەباریکە 🇮🇷 قُمری

**تروان / tirwan/**: چاوگ. چڵ دان 🇮🇷 نبض داشتن

**تراوندن / tirwandin/**: چاوگ. پـت لێـدان؛ چـڵ لێدان 🇮🇷 نبض زدن

**تروسک / t(i)rusk/**: ناوەڵناو. زرینگ؛ زیرەک؛ زیتەڵ ﷼ زرنگ

**تروسکانەوە / t(i)ruskanewe/**: چاوگ. شەوق دانەوە؛ تیشک دانەوە ﷼ پرتو افکندن

**تروسکە / t(i)ruske/**: ☜ **تروسکە**

**تروشکان / t(i)ruşkan/**: ☜ **تروشکان**

**تروشکە / t(i)ruşke/**: ☜ **ترشۆکە**

**تروشکیان / t(i)ruşk(i)yan/**: ☜ **تروشکان**

**ترولاق / t(i)rulaq/**: ناو. تەپالە ﷼ تاپالە

**تروم / t(i)rum/**: ناو. ڕەگەز؛ بنچینە ﷼ نژاد

**ترومبیل / t(i)rumbîl/**: ناو. ترۆمبێل؛ ترومبیل؛ ترۆمبێل؛ ماشین؛ ماشێن؛ سەیارە؛ گەڕۆک ﷼ اتومبیل؛ خودرو

**ترومپا / t(i)rumpa/**: ناو. تورمپا؛ تورومپا: ١. دینەمۆ؛ شیرە؛ پەمدەر؛ ئامراز یان دەزگایەک بۆ گواستنەوەی تراو لە خەزێنە یان دەفرێکەوە بۆ شوێنێکی‌تر ٢. ئامرازی با تێکردن ﷼ ١و٢. تلمبه

**ترۆپ / t(i)rop/**: ناو. چڵەپۆپە؛ ترۆپک ﷼ بلندترین نقطه

**ترۆپک / t(i)ropk/**: ناو. ١. لووتکە؛ دوندی کێو ‹دەڕۆم بەرەو ئاسۆ، بەرەو ئاسۆی ڕوون/ دەڕۆم، دەڕۆم، تا ترۆپکی ڕزگار بوون «هێمن»› ٢. نووک؛ بلندترین شوێن لە دار ﷼ ١. قُلە ٢. بلندترین نقطەی درخت

**ترۆزی / t(i)rozî/**: ناو. ترێزوو؛ تەرۆزی؛ چەماو؛ چەمیلە؛ شارۆخ؛ شارۆق؛ قتی؛ چەمرە؛ خەیارچەمەر؛ چەمەرەخەیار؛ خەیار چەمبەر؛ خیارشینگ؛ خیارشنگ؛ کالیاری فەریک و کاڵ، بە شێوەی کەوان، بە پێستی ڕێ- ڕێ و زرووەوە ﷼ خیارچنبر

**ترۆقان / t(i)roqan/**: چاوگ. ترۆقیان: ١. زۆر ترسان؛ زەندەق چوون ٢. بازدان لە شەڕ؛ هەڵاتن لە بەر نەیار ﷼ ١. زهرەترک شدن ٢. هزیمت کردن

**ترۆقانن / t(i)roqanin/**: چاوگ. ١. زەندەق بردن؛ ترساندن ٢. شکاندن لە شەڕ ﷼ ١. زهرەترک کردن ٢. هزیمت دادن

**ترۆقە / t(i)roqe/**: ناو. چۆنیەتی شکان لە شەڕ ﷼ هزیمت

**ترۆقیان / t(i)roqyan/**: ☜ **ترۆقان**

**ترۆقین / t(i)roqîn/**: چاوگ. پەقان؛ پەقیان؛ پەقین؛ تەقین ﷼ ترکیدن

**ترۆمبێل / t(i)rombêl/**: ☜ **ترومبیل**

**ترۆمتە / t(i)romte/**: ناو. تورومتە؛ توورونتە؛ تۆرمتە؛ تۆرنتە؛ مشەگرە؛ هەڵەکەسەما؛ هەلەکەسەما؛ هێلەکەسەما؛ سەماکەرە؛ تیرە باڵندەیەکە لە تۆرەمەی هەڵۆ و خێزانی شەهێنەکان بە درێژایی ٢٦ تا ٣٢ سانتی‌میتر، نیر و مایان لە یەک ناچێ و لە دەوروبەری زەلان، تەپۆلکەی خیزەڵان و ڕەوەزی لێواری ئاو دەژین ﷼ تُرمتای

**ترووسک[١] / t(i)rûsk/**: ناو. بریقە؛ درەوشە ﷼ درخشش

**ترووسک[٢]**: ناوەڵناو. ١. چالاک و مەزبووت ٢. ناسک و ڕێک و لەبار ﷼ ١. چُست و چالاک ٢. ظریف

**ترووسک[٣]**: پێرۆ. ← **تەسك‌وترووسك**

**ترووسکان / t(i)rûskan/**: چاوگ. ترووسکیای: ١. بریقانەوە؛ بریقە دان ٢. ترووکانی چاو؛ پەلکی چاو بە سەر یەکا هاتن ﷼ ١. درخشیدن ٢. پلک برهم آمدن

**ترووسکاندن / t(i)rûskandin/**: چاوگ. ترووسکانن؛ ترووسکنای؛ چاو ترووکاندن؛ ترووکاندنی پێڵووی چاو ﷼ پلک بر هم زدن

**ترووسکاندنەوە / t(i)rûskand(i)newe/**: چاوگ. تەیساندن ﷼ درخشان کردن

**ترووسکانن / t(i)rûskanin/**: ☜ **ترووسکاندن**

**ترووسکانەوە / t(i)rûskanewe/**: چاوگ. تیەبەر.

//ترووسکایەوە؛ دەترووسکێیەوە؛ بترووسکێوە// ترووسکیانەوە؛ بریقە دان؛ درەوشینەوە ☫ درخشیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ترووسکاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەترووسکانەوە

**ترووسکایی** / t(i)rûskayî/: ناو. ڕووناکی زۆر کەم؛ پیچەک ڕۆهنی ‹ئەمشەو هاتووم/ ترووسکایی شاری یادگار بانگی کردووم «پەشێو»› ☫ سوسو؛ روشنایی بسیار کم

**ترووسکنای** / t(i)rûsknay/: ☜ **ترووسکاندن**

**ترووسکە** / t(i)rûske/: ناو. تروسکە؛ تریسکە: ١. بریقە ‹ترووسکەی برووسکەی شەوی دەمبەهاری بەهەورە/ لە سەر عاسمانی زەوی ڕاخوشاوە «سوارە»› ٢. برووسکەی ئاسمان ☫ ١. درخشش ٢. برق آسمان

**ترووسکەدار** / t(i)rûskedar/: ئاوەڵناو. بەلۆق؛ بەبریقە ☫ درخشنده

**ترووسکیانەوە** / t(i)rûsk(i)yanewe/: ☜ **ترووسکانەوە**

**ترووسکیای** / t(i)rûsk(i)yay/: ☜ **ترووسکان**

**ترووشقنای** / t(i)rûşqnay/: ☜ **تەڕاندن**

**ترووشقیای** / t(i)rûşqyay/: ☜ **تەڕان**

**ترووشک** / t(i)rûşk/: ناو. هەڵتووتەک؛ هەڵتروشک؛ قوونەڵتس ☫ چُمباتمه

**ترووشکان** / t(i)rûşkan/: چاوگ. تروشکان؛ تروشکیان؛ ترووشکیان؛ تووتەکان؛ لە سەر چینچک ڕۆنیشتن ☫ چُمباتمه زدن

**ترووشکیان** / t(i)rûşk(i)yan/: ☜ **ترووشکان**

**ترووک** / t(i)rûk/: ئاوەڵناو. سلۆک؛ چلەک ☫ رموک

**ترووکان** / t(i)rûkan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //ترووکای؛ دەترووکێ؛ بترووکێ// ترووکیای: ١. بە سەر یەکا هاتنی وەک پێلووی چاو ٢. تووکان؛ شکانی دەنک بە دەندووک و بە ددان ☫ ١. برهم آمدن پلک چشم ٢. شکستن تخمه

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ترووکاو/ چاوگی نەرێنی: نەترووکان

**ترووکاندن** / t(i)rûkandin/: چاوگ. تێپەڕ. //ترووکاندت؛ دەترووکێنی؛ بترووکێنە// ترووکانن؛ ترووکنای: ١. لێکنان و کردنەوەی جاروباری (وەک: پێلووی چاو) ٢. تووکانن؛ شکاندنی دەنک بە دەندووک و ددان ٣. شکاندنی تێکوڵی هێلکە لە لایەن جووجکەوە ٤. بە دەندووک هێلکە شکاندنی مریشک ☫ ١. بر هم زدن (پلک) ٢. شکستن تخمه ٣. شکستن تخم و بیرون آمدن جوجه ۴. شکستن تخم توسط مرغ

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـــ/ چاوگی نەرێنی: نەترووکاندن

**ترووکانن** / t(i)rûkanin/: ☜ **ترووکاندن**

**ترووکنای** / t(i)rûknay/: ☜ **ترووکاندن**

**ترووکە** / t(i)rûke/: ناو. ١. ڕووناکی کەمی چرا و ئاگر ٢. چاو لێکنانێک ☫ ١. سوسوی چراغ و آتش ٢. یک چشم به هم زدن

**ترووکیای** / t(i)rûkyay/: ☜ **ترووکان**

**تروم** / t(i)rûm/: ناو. ڕەگەز؛ تۆرەمە؛ ڕەسەن؛ بنەچەکە؛ نەژاد ☫ نژاد

**ترە** / t(i)re/: ناو. ١. ☜ **ترێ** ٢. کیژۆڵە؛ کناچە ☫ ١. ☜ **ترێ** ٢. دختر کوچولو

**ترەختان** / t(i)rextan/: ناو. چوارناڵە؛ پڕتاف ☫ چهار نعل

**ترەشکە** / t(i)reşke/: ناو. بەڵای سروشتی وەک هەورەتریشقە، لافاو و تۆفان و... ☫ بلای طبیعی

**ترەقاندن** / t(i)reqandin/: ☜ **ترەکاندن**

**ترەقە** / t(i)reqe/: دەنگەناو. حیلکە؛ تریقەی پێکەنین؛ دەنگی بەرزی خەنین ☫ قهقهه

**ترەقیان** / t(i)reqyan/: چاوگ. لە تریقە دان؛

حیلكانەوە ☰ هر- هر خندیدن

**ترەك** /t(i)rek/: ناو. دەرز؛ درز؛ قەڵشی باریک. هەروەها: **ترەک بردن** ☰ ترک؛ درز

**ترەكان** /t(i)rekan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //ترەکای؛ دەترەکێی؛ بترەکێ// ترەکین؛ ترەکیان: ١. زەنگ بردن؛ پەڕتین؛ شەق بردن؛ قەڵشیان؛ لێ پەیا بوون و دەرکەوتنی درز یا قەڵش لە دیوارۆکەی شتێک بە هۆی پەستاوتەیی یان گوشارەوە ٢. تەقین؛ تەقینەوە؛ فرەقین ٣. ترەک بردن؛ قەڵش بردنی پێست یان ئێسقان بە هۆی نەخۆشین یان کوتیانەوە ☰ ١تا٣. ترکیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ترەکاو/ چاوگی نەرێنی: نەترەکان

**ترەكاندن** /t(i)rekandin/: چاوگ. تێپەڕ. //ترەکاندت؛ دەترەکێنی؛ بترەکێنە// ترەکانن؛ تەقاندنەوە؛ تەقاندن؛ توقانن؛ تەقنایوە؛ قلیشاندن؛ ترەقاندن؛ بوونە هۆی قەڵشان یان درز بردن یا لێک جیا بوونەوەی شتێک ☰ ترکاندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ــــ/ چاوگی نەرێنی: نەترەکاندن

**ترەكانن** /t(i)rekanin/: ☜ **ترەکاندن**

**ترەكای** /t(i)rekay/: چاوگ. ترووکان: ١. درز بردن ٢. زان؛ زایین؛ بێچوو هێنان (سەگ‌ئاسا) ☰ ١. ترک برداشتن ٢. زاییدن (سگ‌سانان)

**ترەكنای** /t(i)reknay/: چاوگ. ترەکاندن ☰ ترکاندن

**ترەكیاگ** /t(i)rekyag/: ئاوەڵناو. قیشاڤ؛ قەڵشیو ☰ ترک برداشته

**ترەكیان** /t(i)rekyan/: چاوگ. ترەکین: ١. دەرز بردن ٢. بێچوو هێنان (سەگ‌ئاسا) ☰ ١. ترک برداشتن ٢. زاییدن (سگ‌سانان)

**ترەكیانەوە** /t(i)rek(i)yanewe/: ☜ **تەقینەوە[1]-٢**

**ترەكیاو** /t(i)rekyaw/: ☜ **تەقیو-١**

**ترەكین** /t(i)rekîn/: ☜ **ترەکیان**

**ترەكیو** /t(i)rekîw/: ☜ **تەقیو-١**

**ترەو** /t(i)rew/: ☜ **تور-١**

**ترەوكە** /t(i)rewke/: ناو. گیایەکی تامتیژە ☰ گیاهی تندمزه

**ترەوەرە** /t(i)rewere/: ناو. کوڕکوڕە؛ کوڕ- کوڕ؛ قەتێ ☰ مرغ سنگخوارە؛ کوکر

**ترەوەڕە** /t(i)reweře/: ناو. کوڕکوڕ؛ کوڕکوڕە؛ قەتێ ☰ باقرقره

**ترەوی** /t(i)rewî/: ☜ **تور-١**

**ترەیلی** /t(i)reylî/: ناو. ترێلی: ١. کەرەستەی گواستنەوەی باری قورس ٢. کەرستەی بارکێشانی تراکتۆر ☰ ١. تریلر ٢. تریلی

**ترهان** /tirhan/: چاوگ. پاڵێوران ☰ تصفیه شدن

**ترهاندن** /tirhandin/: چاوگ. پالاوتن ☰ تصفیه کردن

**تری** /t(i)rî/: ☜ **ترێ**

**تریاق** /tiryaq/: ناو. دژەژار ‹تریاقی نامەکەت کە گەیی بێخودی سەلیم/ باکی لە ماری غەم نییە، گەرچی کوشندەیە «بێخود»› ☰ پادزهر

**تریاك** /tiryak/: ناو. تلیاک؛ شیلەی خاشخاش کە تازەکەی سپییە و پاش ماوەیەک دەبێتە ڕەنگی کەمکۆڵی ئاماڵ‌زەرد ☰ تریاک

**تریاكخۆر** /tiryakxor/: ☜ **تریاکی**

**تریاككێش** /tiryakkêş/: ☜ **تریاکی**

**تریاكی** /tiryakî/: ئاوەڵناو. تریاکخۆر؛ تریاککێش؛ تلیاکی؛ تلیاکخۆر؛ تراکخۆر؛ تلیاککێش؛ گیرۆدەی تریاک ☰ تریاکی

**تریان** /tiryan/: ناو. تەریان؛ تریانە؛ تلیان؛ قەرتاڵەی چکۆڵەی میوە ☰ سبد کوچک میوه

**تریانە** /tiryane/: ☜ **تریان**

**تریت** /t(i)rît/: ناو. ١. تێکوشین؛ نانی وڵیو لە شۆربادا ٢. سەرکۆنە؛ لۆمە ☰ ١. ترید ٢. سرزنش

**تریتان** / t(i)rîtan/: ☚ **تراتێن**

**تریتانێ** / t(i)rîtanê/: ☚ **تراتێن**

**تریتیوم** / t(i)rîtyum/: ناو. توخمی ئیزوتۆپی هیدرۆژن، بە کێشی ئەتومی ٣,٠١٦ وە ☰ تریتیُم

**تریچ** / t(i)rîc/: ناو. بەرزیلە؛ ئاتەک؛ شاقەل ☰ تریز

**تریزە** / t(i)rîze/: ناو. کونی قنگ ☰ مقعد

**تریژ** / t(i)rîj/: ☚ **تیشك ـ١**

**تریسک** / t(i)rîsk/: ناو. نوور؛ تیشک ☰ نور

**تریسکە** / t(i)rîske/: ☚ **ترووسکە**

**تریسکەتریسک** / t(i)rîsket(i)rîsk/: ناو. بریقەی یەک لە دوو یەک ☰ درخشش

**تریشق** / t(i)rîşq/: ☚ **تریشك**

**تریشقە** / t(i)rîşqe/: ناو. برووسکەی هەور ☰ برق آسمان

**تریشک** / t(i)rîşk/: ناو. تریشق؛ تریشکە؛ تیشک ☰ اشعه

**تریشکدار** / t(i)rîşkdar/: ناوەڵناو. بریقەدار؛ پرشنگدار ☰ درخشان

**تریشکە** / t(i)rîşke/: ناو. ١. هەورەبرووسکە ٢. ☚ **ترشۆکە** ☰ ١. برق آسمان ٢. ☚ **ترشۆکە**

**تریفە** / t(i)rîfe/: ناو. ١. تریوە؛ ترێفە؛ تیشکی مانگ ‹تریفەی کارەبا ئێستا لە ناو حەوز و درەختا وەک/ تریفەی مانگ و ئەستێرە شەوانی سایەقەی پاکە «بێکەس»› ٢. لوو لە ناو گۆشتدا (نەخۆشییەکی ڕەشەولاخە) ☰ ١. مهتاب ٢. غدّه‌ای که میان گوشت حیوان پدید آید

⊡ **تریفە بون**: کز بوون (بەرخ و ...) بە هۆی لە شیر برینەوە ☰ لاغر شدن (بره و ...) به دلیل بُریدن از شیر

**تریق** / t(i)rîq/: ☚ **تریقە**

**تریقانەوە** / t(i)rîqanewe/: چاوگ. تێنەپەر. //تریقایەوە؛ دەتریقێیەوە؛ بتریقەوە// پێکەنین بە دەنگی بەرز ☰ قهقهه زدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: تریقاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەتریقانەوە

**تریق‌وهۆڕ** / t(i)rîq û hoř/: دەنگەناو. پریق‌وهۆڕ؛ قاقا؛ دەنگی پێکەنینی بەرز و حیلکەحیلک ☰ قاه ـ قاه خنده

**تریقە** / t(i)rîqe/: دەنگەناو. تریق؛ دەنگی پێکەنین ‹ئەمجا لە پشت مۆسیقاوە، بە دەم تریقەی قاقاوە/ بچۆرە سەر جێی بەرزی شار، تێر بمژە هەوای بۆچرووکدار! «گۆران»› ☰ قهقهه

**تریقەتریق** / t(i)rîqet(i)rîq/: دەنگەناو. تریقەی زۆر ☰ قهقهەی طولانی

**تریکاندن** / t(i)rîkandin/: چاوگ. تریکانن؛ زریکاندن؛ قیژاندن؛ زیڕاندن ☰ جیغ کشیدن

**تریکانن** / t(i)rîkanin/: ☚ **تریکاندن**

**تریکە** / t(i)rîke/: دەنگەناو. قیژە؛ زیڕە؛ زریکە ☰ جیغ

**تریمارا** / t(i)rîmara/: ☚ **تریمارانە**

**ترین**[1] / t(i)rîn/: ☚ **تەنور**

• **ترین**[2]: پاشگر. نیشانەی ئاوەڵناوی بالا ‹باش‌ترین؛ بەرزترین؛ نزم‌ترین› ☰ ـ ترین

**ترینگ** / t(i)rîng/: ☚ **ترینگە**

**ترینگانەوە** / t(i)rînganewe/: چاوگ. ١. بزە گرتن؛ زەردە کردن ٢. پشکووتن ☰ ١. لبخند زدن ٢. شکُفتن

**ترینگوهۆڕ** / t(i)rîng û hoř/: ناو. ترینگەترینگ؛ دەنگی وێک‌کەوتنی خشروخاڵ ☰ صدای به هم خوردن زیورآلات

**ترینگە** / t(i)rînge/: ناو. ترینگ؛ دەنگی وێک‌کەوتنی دەفری مسین لە یەک یان تەپڵ و دایرە ☰ صدای به هم خوردن ظروف مسی یا طبل

**ترینگەترینگ** / t(i)rînget(i)rîng/: ☚ **ترینگوهۆڕ**

**ترینە** / t(i)rîne/: ناو. دۆلاش ☰ ناو آسیاب

**تریو** / t(i)rîw/: ☜ **تیرو**[1]

**تریواندن** / t(i)rîwandin/: چاوگ. ژان کـردنی لەش ‹نەخۆشم، تەواوی گیانم دەتریوێنێ› ☰ درد کردن بدن

**تریوە** / t(i)rîwe/: ☜ **تریفە-١**

**ترێ** / t(i)rê/: ناو. ترە؛ تری؛ هەنگوور؛ هەنگووری؛ هەنگۆر؛ هەنگوورە؛ هنگور؛ هنگەریر؛ هەنگیر؛ هەنوویر؛ هەوور؛ ئەنگوور؛ ئەنیوور؛ ئەنگیر؛ هالێ؛ میوەی دارەمێو ☰ انگور

**ترێپەزان** / t(i)rêpezan/: ناو. مانگی خەرمانان؛ کاتی ترێ گەیشتن ☰ ماه شهریور، موسم انگور

**ترێڕێوی** / t(i)rêřêwî/: ☜ **ترێمارانە**

**ترێز** / t(i)rêz/: ناو. سڵ؛ ڕەو ☰ رم

**ترێزوو** / t(i)rêzû/: ☜ **ترۆزی**

**ترێشتە** / t(i)rêşte/: ☜ **تەشوێ**

**ترێفە** / t(i)rêfe/: ☜ **تریفە-١**

**ترێق** / t(i)rêq/: ☜ **تەریق**

**ترێلی** / t(i)rêlî/: ☜ **ترەیلی**

**ترێمارانە** / t(i)rêmarane/: ناو. تریمارا؛ ترێمارە؛ تەماتەمرۆژە؛ ڕێزەڵەمارانە؛ ڕێزڵە؛ ڕێزەڵە؛ ڕەزڵە؛ هلەزرە؛ هەڵەڕیزە؛ حلەزرە؛ هەڵەڕزگە؛ ئاڵەڕزگە؛ ڕەزگی؛ ترێڕێوی؛ ڕەسلی ڕووڤی؛ هەلالەوزەمزەم؛ ڕەزڕەزۆک؛ تووڵەزەڕە؛ شیرینوتاڵ؛ قەبقەبۆک؛ گیایێکی چەند ساڵەیە گوڵی سپی یان بەنەوش دەدا و میوەکەی زەردە ☰ تاجریزی

**ترێمارە** / t(i)rêmare/: ☜ **ترێمارانە**

**تڕ**[1] / tiř/: دەنگەناو. [شوورەیی] ١. بای دەنگداری قوون ‹تڕ لە جوابی وڕ «مەسەل»› ٢. [کینایە] شتی بێبایەخ ‹ئەحواڵم بە دەست تووە زۆر شڕە/ سەد بەڵێن بدەی لە لای من ترە «بێکەس»› ☰ ١. گوز ٢. پوچ

▣ **تڕی بن گۆم**: [شوورەیی، مەجاز] تڕی کەنداڵ؛ بێسەر و شوێن ☰ بێنشان

**تڕی خوسرەو**: [پلار] بەردەوام؛ بێ بڕانەوە ‹باسی زولفی درێژ و چاوی بە خەو/ نەبڕاوە، بووە تڕی خوسرەو «حاجی قادر»› ☰ کش پیدا کرده

**تڕی کەنداڵ**: ☜ **تڕی بن گۆم**

▣ **تڕ بڕین**: [پلار] بەزاندن ☰ مغلوب کردن

**تڕ بۆ کەسێ دانەوە**: [شوورەیی، مەجاز] بێقەوڵی کردن؛ بە قسە نەکردن ☰ تره برای کسی خُرد نکردن

**تڕ بۆ کەندن**: [پلار] گوون دە مست نان؛ هیچ نەسیب نەکردن ‹لێرەوە چوو بە هیوای ئەوەی بەشێکی پێببڕێ، تڕێکیان بۆ کەند و هاتەوە› ☰ گوز حواله دادن

**تڕ بە تاق نەهاتن**: [شوورەیی، مەجاز] خۆشی و شادی زۆر هەبوون ☰ شاد بودن بیش از اندازه

**تڕ بەردان**: ☜ **تڕ دانەوە**

**تڕ بە قەدەر قنگی خۆ دانەوە**: [شوورەیی، مەجاز] بە قەد بەڕەی خۆ پێ داکێشان؛ پای زیادی دانەکێشان ‹ئەو کچە بۆ تۆ نابێ تڕ بە قەدەر قنگی خۆت بدەوە› ☰ پا از گلیم خود درازتر نکردن

**تڕ پێکەندن**: [شوورەیی، مەجاز] کەسێک خستنە تەنگانەوە ☰ کسی را به گُه خوردن انداختن

**تڕ دان**: ☜ **تڕ دانەوە**

**تڕ دانەوە**: تڕان؛ تڕ دان؛ تڕ بەردان؛ تڕ لێدان؛ تڕ کەندن ☰ گوزیدن

**تڕ شکاندن**: [پلار] تەریق کردنەوە؛ شەرمەزار کردن ☰ شرمنده کردن

**تڕ کەندن**: ☜ **تڕ دانەوە**

**تڕ لە خۆ دەرچوون**: [شوورەیی] خۆبایی بوون؛ غلوور بوون ☰ مغرور شدن

**تڕ لێدان**: ١. ☜ **تڕ دانەوە** ٢. [کینایە] خۆ هەڵکێشان ☰ ١. ☜ **تڕ دانەوە** ٢. لاف زدن

**تڕی بە دو شایی بۆ نەکەندن**: [شوورەیی، پلار]

هیچ گوێ پێنەدان؛ هیچ خێر پێنەگەیاندن ‹لە بەیانییەوە بە گوێیدا دەخوێنم تڕی بە دوو شاییم بۆ ناکەنێ!› ≣ تره برایش خُرد نکردن

**تڕ**[۲]: دەنگ. ئەی تڕ؛ تڕحێو؛ تڕهێو ‹تڕا دەتوانی!› ≣ زکی

**تڕئەستور** / tiřestûr/: ☜ **تڕزل**

**تڕاڵ** / t(i)řał/: ئاوەڵناو. ١. شل‌وشەویق؛ سست ٢. بێکارە؛ هیچ لێ نەهاتوو ≣ ١. سُست ٢. تنبل

**تڕان** / t(i)řan/: چاوگ. تێنەپەڕ. *[شوورەیی]* //تڕای؛ دەتڕی؛ بتڕە// بای بەدەنگ بەردان ≣ گوزیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: تڕاو/ چاوگی نەرێنی: نەتڕان

**تڕاندن** / t(i)řandin/: چاوگ. تێپەڕ. *[شوورەیی]* //تڕاندت؛ دەتڕێنی؛ بتڕێنە// تڕانن؛ تڕنای: ١. هێنانە تڕین؛ تڕ پێ‌کەندن ‹پووڕێ نەئەتڕی، بە زۆر ئەیانتڕان «مەسەل»› ٢. *[کینایە]* پرزە بڕین و تەمێ کردن ≣ ١. وادار به گوزیدن کردن ٢. تنبیه کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەتڕاندن

**تڕانن** / t(i)řanin/: ☜ **تڕاندن**

**تڕانە** / t(i)řane/: ناو. *[شوورەیی]* تیز؛ کاری گەمە پێ‌کردن ≣ استهزاء؛ مسخره

⊡ **تڕانە کردن**: *[شوورەیی]* تیز پێ‌کردن ≣ مسخره کردن

**تڕانێ** / t(i)řanê/: ناو. هەلووکێن؛ هەلووکان ≣ بازی الک‌دولک

**تڕای** / t(i)řay/: چاوگ. *[شوورەیی]* تڕان ≣ گوزیدن

**تڕبڕ** / tiřbiř/: ئاوەڵناو. سەرپۆت؛ سەرسەری؛ سەرچڵ ≣ سطحی؛ سرسری

**تڕپن** / t(i)řpin/: ئاوەڵناو. *[شوورەیی]* تڕن ≣ گوزو

**تڕتڕک** / tiřtiřik/: ناو. تڕتڕۆک؛ تڕتڕۆک؛ سوورێنچکە؛ ستۆکرک؛ لوولەی سووری لە ناوەوە گەو-گەوە، هەناسەی پێدا دێ ≣ نای

**تڕتڕوک** / tiřt(i)řuk/: ☜ **تڕتڕك**

**تڕتڕۆک** / tiřt(i)řok/: ناو. ١. ☜ **تڕتڕک** ٢. پارچەیەک لە ڕیخۆڵە ≣ ١. ☜ **تڕتڕك** ٢. بخشی از روده

**تڕتڕە**[۱] / tiřt(i)ře/: ناو. ١. گیایەکی وەک هەودا دەزووی زەردە، لە سەوزی دەهاڵێ و وشکی دەکا ٢. سەرمازەڵە؛ جۆرێ مارمێلکە ٣. *[مەجاز]* موتۆرسیکلێت ٤. کرمی نۆک؛ مێملی نۆک ≣ ١. گیاه سِس ٢. چلپاسه ٣. موتورسیکلت ۴. کِرم آفت نخود

**تڕتڕە**[۲]: ئاوەڵناو. *[پلار]* زلی تەوەزەل ≣ گُندەبگ

**تڕتڕی** / tiřt(i)ři/: ئاوەڵناو. *[پلار]* خۆهەڵکێشی بێ‌هونەر ≣ لافزن

**تڕتفاق** / tiřt(i)faq/: ناو. *[پلار]* تڕوتفاق؛ خڕەوپڕە؛ شەخەڵ‌ومەخەڵ ≣ خرت و پرت

**تڕتۆپ** / tiřtop/: ☜ **تڕزل**

**تڕتە پاڵ** / tiřtepał/: ئاوەڵناو. *[پلار]* تەمەڵ؛ تەوەزەل؛ دەستەوسان ≣ تنبل

**تڕتەقەڵ** / tiřteqeł/: ☜ **تەقەڵتڕۆزی**

**تڕتەمانی** / tiřtemanî/: ناو. موسولدان؛ میزەڵدان ≣ مثانه

**تڕتەمیس** / tiřtemîs/: ئاوەڵناو. ١. *[پلار]* شەوکوێر؛ تایبەتمەندی کەسێ کە بە شەو نابینێ ٢. ☜ **تەڕتەمیس** ≣ ١. شبکور ٢. ☜ **تەڕتەمیس**

**تڕچماق** / tiřç(i)maq/: ئاوەڵناو. *[پلار]* زەلام و زەبەلاحی ناقۆلا ≣ درشت بدریخت

**تڕحێو** / tiřḧêw/: دەنگ. *[پلار]* تڕهێو؛ وشەی گاڵتە پێ‌کردن ‹تڕحێو لەو کارەی کردت!› ≣ زکی

**تڕزل** / tiřzil/: ئاوەڵناو. *[پلار]* تڕئەستوور؛ تڕتۆپ؛ خۆبایی؛ بەفیز؛ لووت‌بەرز ≣ مُتکبر

**تڕزلی** / tiřz(i)lî/: ناو. *[پلار]* فیز و بایی‌هوایی ≣ تکبُر

**تڕشک** / tiřşik/: ناو. ١. خۆرشت؛ خوەرشت؛ مەرگە ٢. کفتەی ساوار و سلق و سماق ≣ ١. خورش ٢. آش کوفتەی بلغور و سُماق

**ترکەر / tiřker/:** ☜ **ترکەن ـ١**

**ترکەڵەک / tiřkełek/:** ناو. *[پلار]* ١. کەڵەک و کەلەسی لەق‌ولۆق ٢. *[مەجاز]* کاری بێ‌بنیات و شل‌وشەویق ⇆ ١. کلک شُل و ول ٢. کار ناشیانه و سُست بنیاد

**ترکەن / tiřken/:** ئاوەڵناو. *[شووره‌یی]* ١. ترکەر؛ ترن؛ تایبەتمەندی کەسێ کە بای بە دەنگی بەرزی لێ بەر دەبێ ٢. *[پلار]* خوێڕی ٣. *[کینایه]* قسەکەری بێ‌کردە ⇆ ١. گوزو ٢. بیکاره و پوچ ٣. یاوه‌گو

**ترلەیلێ / tiřleylê/:** ئاوەڵناو. *[پلار]* حولحولی و گەللایی ⇆ بی‌بندوبار

**ترن / tiřin/:** ئاوەڵناو. *[شووره‌یی]* ترنە: ١. ترکەن ‹وڕن و ترن هەر هیلاک نابن «مەسەل»› ٢. *[پلار]* بێکارەی خوێڕی ⇆ ١. گوزو ٢. بیکاره

**ترنای / tiřnay/:** ☜ **تراندن**

**ترنە / tiřne/:** ☜ **ترن**

**تروتفاق / tiř û t(i)faq/:** ☜ **ترتفاق**

**تروتۆپ / tiř û top/:** ناو. *[پلار]* پۆز و هەوا؛ فیز و ئیفادە ⇆ تکبُر

**تروتەوێڵە / tiř û tewêłe/:** ناو. *[پلار]* شتی بێ بایی و هیچ و پووچ ⇆ چیز بی‌ارزش و الکی

**تروزڕ / tiř û ziř/:** ناو. *[پلار]* فیز و دەعیە ⇆ تکبُر

**تروفیز / tiř û fîz/:** ناو. *[پلار]* لووت‌بەرزی؛ دەعیە و دەمار ⇆ تکبُر

**ترومبیل / t(i)řumbîl/:** ☜ **ترومبیل**

**ترۆ / t(i)řo/:** ئاوەڵناو. ١. بێ‌ئابڕوو ‹دنیا تیاترۆیە، مەوەستە تیا، بڕۆ!/ کێ مایەوە تیا کە نەبووبێ تیا، ترۆ؟ «مەحوی»› ٢. دەرکراو بە سووکایەتی ٣. نالەبار و درژ ⇆ ١. رسوا ٢. رانده شده با اهانت ٣. زشت و بداخم

⊡ **ترۆ کردن** ١. ئاوڕوو بردن ٢. دەرکردن بە سووکایەتی ⇆ ١. رسوا کردن ٢. راندن با توهین

**ترۆکراو / t(i)řok(i)raw/:** ئاوەڵناو. قەشتی ⇆ رانده شده

**ترۆڵ¹ / t(i)řoł/:** ناو. ڕیخ؛ شیاکە ⇆ سرگین

**ترۆڵ²:** ئاوەڵناو. *[شووره‌یی]* ١. زۆر ترکەن ٢. *[پلار]* پیس؛ چەپەڵ ⇆ ١. گوزو ٢. کثیف

**ترۆمبێل / t(i)řombêl/:** ☜ **ترومبیل**

**ترە / t(i)ře/:** ئاوەڵناو. *[شووره‌یی، کینایه]* خوێڕی؛ هیچ لێ نەهاتوو ⇆ نالایق

**ترەتر¹ / t(i)řetiř/:** ناو. *[کینایه]* چەنەبازی و چەقەسرۆیی بێ‌مانا ⇆ یاوه‌گویی

**ترەتر²:** دەنگەناو. دەنگی بەرز و ئازاردەر ‹ترەتری موتور› ⇆ صدای بلند و مزاحم

**ترەک / t(i)řek/:** ئاوەڵناو. *[پلار]* ١. بێکارە؛ خوێڕی ٢. بێ‌ئابڕوو ⇆ ١. بیکاره ٢. بی‌آبرو

**ترەکەڵەک / t(i)řekełek/:** ناو. *[پلار]* کاری سەرنەگرتوو ‹دیی فره کویخا مسکین هەڵناگرێ/ ترەکەڵەکێ دیارە سەر ناگرێ «پیرەمێرد»› ⇆ کار نشدنی

**ترەمەڕۆ / t(i)řemeřo/:** ناو. *[پلار]* تفەنگی خراپ ⇆ تفنگ خراب

**ترەوراوێ / t(i)řew(i)řawê/:** ناو. ١. چەنەدرێژی؛ درێژدادڕی ٢. هەڵیت‌وپەڵیت ⇆ ١. رودەدرازی ٢. چرت‌وپرت

**ترهێو / tiřhêw/:** ☜ **ترحێو**

**ترین / t(i)řîn/:** چاوگ. *[شووره‌یی]* بای بە دەنگ بەردان ‹پیاو نەگبەتی بێ لە لای با ئەترێ «مەسەل»› ⇆ گوزیدن

**تز / tiz/:** ناو. ڕەوتی دەڵان؛ نم دانەوە ⇆ ترشُح

**تزان / t(i)zan/:** چاوگ. کۆ بوونەوەی دەڵاو ‹فرمێسک لە چاوم تزا› ⇆ آب زاییدن

**تزبی / tizbî/:** ☜ **تەزبێح**

**تزۆک / t(i)zok/:** ئاوەڵناو. *[پلار]* ئەتوارخراپ ⇆ بداطوار

**تژ** / tij/: ئاوەڵناو. تەژ؛ پڕ ☰ پُر

**تژە** / t(i)je/: ئاوەڵناو. تژی؛ پڕ؛ لیپاولیپ؛ دارماڵ ☰ پُر؛ مالامال

**تژی**[1] / t(i)jî/: ناو. کورەبەش؛ چاڵەکە ☰ گورکن

**تژی**[2]: ئاوەڵناو. پڕ؛ تژە ‹خۆزگە دیسان تژی دەبووینەوە/ لە کڵپە و گڕ، شێتی و جوانی «پەشێو»› ☰ پُر؛ مالامال

**تس** / tis/: دەنگەناو. *[شووره‌یی]* فس؛ سیک؛ واولەی؛ بایێ کە بێدەنگ لە ڕیخۆڵەوە فت دەبێ ‹بە تسێ هەڵدەچێ و بە فسێ ئەنیشێتەوە «مەسەل»› ☰ چُس

▣ **تس بەردان**: *[شووره‌یی]* تسین؛ تس دانەوە ☰ چُسیدن

**تس دانەوە**: *[شووره‌یی]* بەردانی فس ☰ چُسیدن

**تس کەندن**: *[شووره‌یی]* تسین؛ بەرەڵا کردنی تس ☰ چُسیدن

**تسان** / t(i)san/: ☜ **تسین**

**تساندن** / t(i)sandin/: چاوگ. تێپەڕ. *[شووره‌یی]* //تساندت؛ دەتسێنی؛ بتسێنە// تسانن: ۱. تس بەردان وە کەسێ ۲. بای شتێ دەرکردن ☰ ۱. چُساندن ۲. باد چیزی را خالی کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: -/ چاوگی نەرێنی: نەتساندن

**تسانن** / t(i)sanin/: ☜ **تساندن**

**تسای** / t(i)say/: چاوگ. *[شووره‌یی]* تسین ☰ چُسیدن

**تسقل** / tisqil/: ناو. تسکل؛ قسقل؛ قسکل؛ بەرێکی دار مازووە ☰ از ثمرهای مازوج

**تسقلەگورگانە** / tisq(i)legurgane/: ناو. تسڵەگورگانە؛ گیایەکە بەرەکەی لە تسقل دەکا ☰ گیاهی با ثمری چون ثمر مازوج

**تسقەلی** / tisq(i)lî/: ئاوەڵناو. *[پلار]* فیسقلی؛ فیسقەلی؛ زۆر پچووک ☰ فسقلی

**تسکل** / tiskil/: ☜ **تسقل**

**تسکوڵیو** / tiskułîw/: ئاوەڵناو. *[پلار]* تەمەڵ و تەوەزەل ☰ تنبل

**تسکەتسک** / tisketisk/: دەنگەناو. شرنگە؛ شریخوهۆڕ؛ دەنگی لێکدانی شیران؛ تەق و هۆڕی شمشێران ☰ چکاچک شمشیر

**تسکەن** / tisken/: ئاوەڵناو. *[شووره‌یی]* ۱. فسۆک؛ تسن؛ زۆر تس بەردەرەوە ۲. *[پلار، کینایە]* ترسەنۆک؛ کەلەزات ☰ ۱. چُسو ۲. ترسو

**تسکەنە** / tiskene/: ☜ **تسن -۱**

**تسڵە** / tisłe/: ناو. تسە؛ جۆرێ کارگی زۆر نەرمە، ژێرەکەی پەڕە-پەڕە نییە، کاتێ وشک دەبێتەوە، گەردێکی وردی لێ دەوەرێ، لە خەنە دەچێ ☰ نوعی قارچ

**تسڵەگورگانە** / tisłegurgane/: ☜ **تسقلەگورگانە**

**تسمۆرگ** / tismorig/: ناو. گیایەکی چکۆلەیە لە ئاڵەکۆک و شنگ دەکا ☰ گیاهی است

**تسن** / tisin/: ئاوەڵناو. *[شووره‌یی]* ۱. تسکەن؛ تسنە؛ تسکەنە؛ فسۆک؛ کوسەک؛ زۆر تس بەردەوە ۲. *[کینایە]* بێکارە و خوێڕی ☰ ۱. چُسو ۲. بیکاره

**تسنای** / tisnay/: چاوگ. *[شووره‌یی]* تساندن؛ با دەرکردن ☰ باد خالی کردن

**تسنایەرە** / tisnayere/: چاوگ. *[شووره‌یی]* تساندن؛ تس بەردان ☰ باد خالی کردن

**تسنە** / tisne/: ☜ **تسن -۱**

**تسوێ** / tiswê/: ☜ **تۆسی**

**تسە** / t(i)se/: ☜ **تسڵە**

**تسەک** / t(i)sek/: ناو. پاڵا؛ پێڵاو؛ هەرچی پا دادەپۆشێ ☰ پای‌افزار

**تسەگورگ** / t(i)segurg/: ناو. فسەگورگ؛ کارگەفسە؛ جۆرێ کارگی ژەهراوییە ☰ نوعی قارچ سمی

**تسەگورگانە** / t(i)segurgane/: ناو. داپیرۆشک؛ خلێرە ☰ خرخاکی

**تسەی** / t(i)sey/: چاوگ. *[شووره‌یی]* تسین ☱ چُسیدن

**تسی** / t(i)sî/: ☜ **ترسی**

**تسیایەرە** / tisyayere/: چاوگ. *[شووره‌یی]* تسان؛ فس بەردان ☱ باد درفتن

**تسین** / t(i)sîn/: چاوگ. تێنەپەڕ. *[شووره‌یی]* //تسیت؛ دەتسی؛ بتسە// تسان؛ تسەی؛ تسای؛ فسین؛ فسیان: ١. تس دان؛ تس کەندن ٢. سوار بوونی نێر لە مێ (بۆ باڵندە) ☱ ١. چُسیدن ٢. جفتگیری کردن پرندگان

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: تسیو/ چاوگی نەرێنی: نەتسین

**تش** / tiş/: ئاوەڵناو. ترش؛ تورش ☱ تُرش‌مزه

**تشاو** / t(i)şaw/: ناو. چێشتی مزراویلکە ☱ آش سُماق و تخم مرغ

**تشپۆ** / tişpo/: ناو. تشپۆک: ١. زیرکە؛ پیزۆکە؛ زیپک ٢. لووی ناو لەش ☱ ١. جوش پوست ٢. غُدّه

**تشپۆک** / tişpok/: ☜ **تشپۆ**

**تشت** / tişt/: ناو. چت؛ چشت؛ شت؛ هین؛ وانێک ☱ چیز

**تشتانۆک** / tiştanok/: ناو. مەتەڵۆکە ☱ مُعما

**تشتومشت** / tişt û mişt/: ناو. شتومەک؛ کەل‌وپەل ☱ خرت‌وپرت

**تشتیر** / tiştîr/: ناو. چوێشتیر؛ بزنی دوو ساڵە ☱ بُز دو ساله

**تشرین** / tişrîn/: ناو. تەشرین؛ ناوی دوو مانگی رۆمی ☱ تشرین

▣ **تشرینی دووهەم:** مانگی یازدەهەم، بەرامبەر بە مانگی نوامبر، ٣٠ رۆژە، لە ١٠ی گەڵاڕێزانەوە تا ٩ی سەرماوەز ☱ تشرین ثانی

**تشرینی یەکەم:** مانگی دەهەم، بەرانبەر بە ئۆکتۆبر، ٣١ رۆژە، لە ٩ی ڕەزبەرەوە تا ٩ی گەڵاڕێزان ☱ تشرین اول

**تشڵەکەین** / tişłekeyn/: ناو. ترشاو؛ شیوی سماق ☱ سوپ سُماق

**تشمەلیچ** / tişmelîç/: ناو. خەزایی؛ ئاگرمەلووچ ☱ سار صورتی

**تشنای** / tişnay/: ☜ **ترشاندن**

**تشیای** / tişyay/: ☜ **ترشان**

**تشین** / t(i)şîn/: ناو. چێشتی بە لەپە و سماق؛ شیوی لەتکە نۆک و ترش ☱ آش لپه و سُماق

**تغوب** / t(i) ğub/: ☜ **تخوب**

**تف**[1] / tif/: ناو. گلۆیز؛ لرگ؛ ئاوی دەم ‹تفی خۆت بکە و برۆ «مەسەل»› ☱ تُف؛ آب دهن

▣ **تفی بەرەو با:** ☜ **تفی سەربەرەوژوور**

**تفی بەرەوژوور:** ☜ **تفی سەربەرەوژوور**

**تفی سەربەرەوژوور:** تفی بەرەو با؛ تفی بەرەوژوور؛ کارێ کە ئاکامی ناخۆشی بۆ خاوەنەکەی دەگەڕێتەوە ‹قانوونیان تفی سەربەرەوژوورە/ مەرگی سەگی هار مەشهوورە سوورە «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☱ تُف سربالا

⊡ **تف کردن/ کرن:** ١. تف هاویشتن ٢. تەڕ کردن بە تف ☱ ١. تُف انداختن ٢. تر کردن با آب دهن

**تف کردن لە دەس:** قۆڵ لێهەڵمالین ☱ آستین بالا زدن

**تف کردنە دەم کەسێکد** *[پلار]* دەرس دادانی کەسێک؛ کەسێک فێری کارێک (ناڕەوا) کردن ☱ کسی را به کاری انداختن

**تف کردنە دەم یەکد** ☜ **تفانە دەم یەک**

**تف کردنەوە/ کرنەوە:** لە دەم دەرهاویشتنی خۆراک ☱ محتوی دهان را تُف کردن

**تف لە دەمدا وشک بوون** *[کینایه]* ١. ماندوو بوون ٢. زمان لاڵ بوون ٣. تووشی ترس و دڵەڕاوکێ بوون ☱ ١. خسته شدن ٢. زبان بند آمدن ٣. دچار ترس و اضطراب شدن

**تف لێکردن**: ١. هاویشتنی تف بۆ شت یان کەسێک ٢. *[کینایە]* دەربڕینی قین و بێزاری 🇮🇷 ١و٢. تف انداختن بر کسی یا چیزی

**تف**[٢]: دەنگ. وشەی تووڕەیی و وەڕەزی ‹تف لەم بەشە، لەم ژیانە حافز!/ ئەو نانە بکەی بە ژەهری ماری «مەلا غەفوور»› 🇮🇷 تُف؛ حرف تنفر

**تفارۆک** / t(i)farok/: ناو. تلەفارک؛ منداڵ 🇮🇷 کودک

**تفاق** / t(i)faq/: ناو. ١. ئازووقە؛ ئازۆخە؛ دەنیقە؛ بژیوی پێداویست لە ماڵدا ٢. کا و گیای ماڵات بۆ زستان ٣. کەلوپەلی پێویستی هەر شوێن یا هەر کارێ، بە تایبەت سەفەر ‹ناریا زادی سەفەر ئامادە کە!/ ڕێگە تەی نابێ بە بێ توێشە و تفاق «ناری»› 🇮🇷 ١. آذوقە ٢. علوفەی زمستان ٣. زاد سفر

**تفاقدان** / t(i)faqdan/: ناو. کادێن؛ لەوەڕدان 🇮🇷 کاهدان

**تفال** / t(i)fal/: ناو. پەڕۆیەکە بە سەر گونکی هەویردا دەدرێت 🇮🇷 روانداز چانەهای خمیر

**تفاڵ** / t(i)fał/: ناو. مناڵ؛ منداڵ 🇮🇷 طفل

**تفان** / t(i)fan/: چاوگ. تف کردن 🇮🇷 تف کردن

⊡ **تفانە دەم یەکد** *[کینایە]* تف کردنە دەم یەک؛ پێکەوە کەینوبەین کردن 🇮🇷 با هم توطئە کردن

**تفاندن** / t(i)fandin/: ☜ **تفانەوە**

**تفاندنەوە** / t(i)fand(i)newe/: ☜ **تفانەوە**

**تفانەوە** / t(i)fanewe/: چاوگ. تێپەڕ. //تفاتەوە؛ دەتفێیەوە؛ بتفێوە// تفاندن؛ تفاندنەوە؛ تفایەوە؛ قووت نەدان و لە دەم دەرهاویشتنی خۆراک 🇮🇷 محتوی دهان را تُف کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: تفاوە/ چاوگی نەرێنی: نەتفانەوە

**تفایەوە** / t(i)fayewe/: ☜ **تفانەوە**

**تفت** / tif(i)t/: ئاوەڵناو. گیر؛ گیر؛ گیل؛ پز؛ ڕوپ؛ بە تامی گیر و دەم وشکەوەکەر ‹وتی: ئەی چۆنی بۆ شووتی و کفتە؟/ گفتت چ تفتە! نانخۆری مفتە! «هەژار، *بۆ کوردستان*»› 🇮🇷 گَس

**تفتەڕوو** / tifteřû/: ☜ **تفەڕوو**

**تفتی** / tiftî/: ناو. ١. گیرایی تام؛ تاڵایی ئاماڵشیرنی ٢. دانوولەی گەنم 🇮🇷 ١. گَسی ٢. گندم آب‌پز

**تفتیک** / tiftîk/: ناو. کولک؛ کولکە 🇮🇷 کُرک

**تفتیلک** / tiftîlk/: ناو. کۆترەباریکە 🇮🇷 قُمری

**تفر** / tifr/: ناو. ١. تویکی بڕوێش و ساوار ٢. پەترۆ؛ قەتماخە 🇮🇷 ١. پوستەی بلغور ٢. کبرەی زخم

**تفرە** / tifre/: ناو. کرێش؛ کراژ 🇮🇷 پوستە؛ شورە

**تفرەمار** / tifremar/: ناو. کاژمار 🇮🇷 پوستەی مار

**تفڕەوەن** / tifřewen/: ناو. شاتوو؛ گاتوو 🇮🇷 شاەتوت

**تفسک** / tifsik/: ☜ **تفسك**

**تفقی** / tifqî/: ئاوەڵناو. قەڵەو؛ پڕگۆشت؛ تێرگۆشت 🇮🇷 چاق؛ گوشتالو

**تفک** / tifik/: ناو. ١. کوانوو؛ ئاگردان؛ وەجاغ ٢. پەلەی دەموچاو ٣. تفەنگ 🇮🇷 ١. أُجاق ٢. لکّەی صورت ٣. تُفنگ

**تفکە** / tifke/: ناو. کوانووی قوڕینە 🇮🇷 آتشدان گِلی

**تفکێ** / tifkê/: ئاوەڵناو. *[پلار]* جنێوێکی ژنانەیە 🇮🇷 دشنامی زنانە

**تفل** / tifil/: ☜ **توێکڵ**

**تفلیک** / tiflîk/: ناو. بەڵغەم؛ ئاخ‌تف 🇮🇷 بلغم

**تفڵ** / tif(i)ł/: ناو. منداڵ؛ بێچوو 🇮🇷 بچە

**تفنک** / tifnik/: ناو. لووت؛ دفن؛ کەپ؛ کەپۆ؛ بێڤل 🇮🇷 بینی

**تفو** / tifû/: دەنگ. وشەی دەربڕینی ڕق و قین ‹تفوو لە دزی و درۆ› 🇮🇷 تفو؛ حرف تحقیر و تنفر

**تفە** / t(i)fe/: ناو. ١. ☜ **توێکڵ** ٢. دیواری قوڕین 🇮🇷 ١. ☜ **توێکڵ** ٢. دیوار گِلی

**تفەدەست** / t(i)fedest/: ناو. وچانێکی کەم 🇮🇷

استراحت اندک

**تفەرەوەن** / t(i)ferewen/: ناو. تووەڕەشـە؛ گـاتوو؛ شاتوو ⚏ شاەتوت

**تفەڕوو** / t(i)feřû/: ئاوەڵناو. [پەلار] تفتـەڕوو؛ ڕسـوا؛ ناوزڕاو؛ ئابڕووتکاو ⚏ رسوا

**تفەزوینە** / t(i)fezewîne/: ☜ **توفەرەنگی**

**تفەسیاوێ** / t(i)fes(i)yawê/: نـاو. شاتوو؛ گاتوو ⚏ شاەتوت

**تفەک** / t(i)fek/: ☜ **تفەنگ**

**تفەن** / t(i)fen/: ☜ **تفەنگ**

**تفەنگ** / t(i)feng/: ناو. تفـەن؛ تفـەک؛ تفـک: ١. بەروەج؛ چەکی گەرمی لوولـەدرێژی گوللـەهاوێژ ‹تفەنگ بۆ نیشان، ئەسپ بۆ مەیدان «مەسـەل»› ٢. هەر ئامرازێک لە بیچمی تفەنگ بۆ سەمپاشـی و ... ⚏ ١. تفنگ ٢. هر نوع ابزار تفنگ مانند

⊡ **تفـەنگ هێنانـە سەر پێ:** ئامـادەی تەقانـدن کردنی چەک ⚏ مسلح کردن تفنگ

**تفـەنگاوێژ** / t(i)fengawêj/: نـاو. ١. بـەرپێک؛ مـەودای هـەرەت کـردنی گوللـەی تفـەنگ ٢. کەسێ کـە تفـەنگ دەهـاوێژێ ⚏ ١. تیـررس ٢. تیرانداز

**تفەنگتەقێن** / t(i)fengteqên/: ناو. ئەوی تفـەنگ دەهاوێژێ ⚏ تیرانداز

**تفەنگچی** / t(i)fengçî/: نـاو. چەکـدار؛ تفەنگـدار؛ خاوەن تفەنگ لە شەڕدا ⚏ تفنگدار

**تفەنگدار** / t(i)fengdar/: ☜ **تفەنگچی**

**تفەنگساز** / t(i)fengsaz/: ناو. توکمەچی؛ شیرگەر ⚏ تفنگساز

**تفی** / t(i)fî/: ناو. تیت؛ شمی؛ توو؛ بەری دارتوو ⚏ توت

**تفیـرک** / t(i)fîrik/: نـاو. گوێزەبانـە؛ گوێزەوانـە؛ میوانی حەوتەی لە دایک بوونی منـاڵ ⚏ جشـن هفتمین روز تولد نوزاد

**تفینـەوە** / t(i)fînewe/: چـاوگ. تێـپەڕ. //تفیتـەوە؛ دەتفیەوە؛ بتفەوە// تف کردنەوە ⚏ تُف کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەتفینەوە

**تڤر** / tivir/: ☜ **تور-١**

**تڤرۆکـە** / tivroke/: نـاو. خەردالـە؛ شـێلمۆک؛ خەردەل ⚏ خَردل

**تڤری** / tivrî/: نـاو. تـەوەرەی ئـاش؛ ئـەو خـڕەی بستەی لە سەرە ⚏ قُطب آسیاب

**تڤسک** / tivsik/: ناو. تفسـک؛ هەنجیرەکێویلـە ⚏ انجیر وحشی

**تڤل** / tivl/: ☜ **توێکڵ**

**تڤنک** / tivnik/: ناو. تیز؛ لقووز؛ پلار ⚏ متلک

**تڤۆ** / t(i)vo/: ☜ **تور-١**

**تڤیای** / tivyay/: چاوگ. تووڕە بـوون ⚏ عصـبانی شدن

**تڤیـرک** / t(i)vîrik/: نـاو. تڤـیلک؛ کۆترەباریکـە ⚏ فاختە

**تڤیلک** / t(i)vîlik/: ☜ **تڤیرک**

**تڤێ** / t(i)vê/: ئاوەڵکار. دڤێ؛ دەبێ ⚏ باید

**تک**[١] / tik/: نـاو. ١. دڵۆپ؛ نم ‹دوو تک خـوێن› ٢. تکە؛ دڵۆپە ٣. نوختە؛ خەوش؛ خەش ‹چ تک تێدا نینە› ⚏ ١. قطرە ٢. چکّە ٣. لکّە

⊡ **تک لێبڕین:** دواچۆڕ هاوردن؛ تەواو کردنی تراو ⚏ تە مایعی را درآوردن

**. تک**[٢]: پاشوشە. ـ دەڵێن؛ وەدەر ‹نمتک› ⚏ تراوا

**تک**[٣]: دەنگ. دەنگی وەک دڵۆپەی ئـاو و بـاران ⚏ چِک؛ صدای افتادن قطرە

**تکـا** / t(i)ka/: ناو. ئەرجوو؛ خوایش؛ لاڵە؛ هـەوین؛ کـار و ڕەوتی ویسـتنی شـتێک بـە شـێوەیێکی ماقووڵانە ‹زینهار لە تکا، مەچۆ بۆ تکا/ کە کەوتیە تکا ئابڕووت تکا «پیرەمێرد»› ⚏ خواهش

⊡ **تکـا کـردن:** ١. وەپـاران؛ ئـەرجوو کـردن ٢. خوایش کردن؛ ویستنی شتێک بە شـێوەیەکی

دەتۆرێنی؛ بتۆرێنە// تـۆران؛ تۆرنـای؛ زیـز/ زویـر کردن ≣ رنجاندن؛ آزُردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەتۆراندن

**تۆرانن / toranin**: ☜ **تۆراندن**

**تۆراو / toraw**: ئاوەڵـناو. تۆریـاگ؛ ڕەنجـاو؛ زیـز؛ زویر ≣ آزُرده؛ قهرکرده

**تۆربە / torbe**: ☜ **توورەکە**

**تۆرتـان / tortan**: نـاو. تورتـان؛ تۆرتـۆ؛ تۆرتـۆر؛ دوێرد؛ مقەست؛ مقەس؛ قەیچی ≣ قیچی

**تۆرتۆ / torto**: ☜ **تۆرتان**

**تۆرتۆر / tortor**: ☜ **تۆرتان**

**تۆرتـۆرە / tortore**: ئاوەڵـناو. سەرسواڵـکەرە؛ سرِسواڵکەر؛ چاو لە دەستی خەڵک ≣ گدامنش

**تۆرکە / torke**: ناو. جۆرێ سـەوزیی خواردنـە ≣ نوعی سبزی خوراکی

**تۆرمتە / torimte**: ☜ **ترۆمتە**

**تۆرنای / tornay**: ☜ **تۆراندن**

**تۆرنتە / torinte**: ☜ **ترۆمتە**

**تـۆرە / tore**: نـاو. ١. شـەرم؛ حـەیا ٢. هەنـەزاو؛ هەنەزاگ؛ فرزەندی هەوێ ٣. زانسـت ≣ ١. آزرم ٢. فرزند هَوو ٣. دانش

**تۆرەڤان / torevan**: ئاوەڵناو. زانا ≣ دانشمند

**تۆرەمە / toreme**: نـاو. ڕەچەڵـەک؛ بنەچەکـە؛ نەژاد ≣ نژاد

**تۆرەمەناس / toremenas**: ناو. ڕەچەڵـەکنـاس؛ پسپۆڕ لە بنەما ناسیندا ≣ نژادشناس

**تۆرەمەنامـە / toremename**: نـاو. ڕەتــەوە؛ ڕەگەزنامە ≣ شجرەنامە

**تۆرەمەند / toremend**: ☜ **توورەوان**

**تۆرەوان / torewan**: ☜ **توورەوان**

**تۆریاگ / toryag**: ☜ **تۆراو**

**تۆریان / toryan**: ☜ **تۆران**

**تۆریای / toryay**: ☜ **تۆران**

**تۆرین / torîn**: ☜ **تۆران**

**تۆرینـۆک / torînok**: ئاوەڵـناو. ١. دڵناسـک ٢. هەمیشە تووڕە ≣ ١. زودرنج ٢. عصبی

**تۆڕ[1] / toř**: ناو. ١. پارچەی زۆر تـەنکچنـراو کـە ئەو دیوی دیـارە ‹تـۆڕی بـووک› ٢. داوی تـۆڕی ‹تۆڕی ماسیگری› ٣. تـۆڕی؛ تـۆڕک؛ چەقـەڵ ٤. ڕەشـکە و پێشـکەی کـە دێتـە بـەر چـاو ٥. کۆمەڵێک ئێزگـە، هێڵـی ڕاگواسـتن و لقـەکانی ‹تـۆڕی کۆمەڵایـەتی فەیسـبووک› ٦. کۆمەڵـێک دامـەزراوە یـان ڕاژەی سـەر بـە ناوچەیـەکی جوگرافیایی ‹تـۆڕی گواسـتنەوە› ٧. ڕێکخراوەیـێ کـە ئەنـدامانی لـە تـاقم و شـوێنی جیـاوازدا چالاکییان هەیە ‹تـۆڕی بـەرەنگار بوونـەوە لەگـەڵ توندوتیژیدا› ≣ ١. پارچەی توری ٢. تور ٣. شُغال ۴. حالت سیاهی رفتن چشم ۵تا۷. شبکه

**تۆڕ[2]**: ئاوەڵناو. ١. سەرشێت؛ چـەمووش؛ بەیـدەس ٢. نامۆ؛ نەبان ‹تورکی تۆڕ تـووڕی ئـەدا بـۆ بـەرێ/ لێـی دەگـەوزن عـەرەبی بـێ دەرپـێ «هـەژار، بـۆ *کوردستان*»› ٣. لە گریوە غار جێماو ≣ ١. رموک؛ چموش ٢. بیگانە ٣. بازندە در مسابقەی دو

**تۆڕئـاوس / toř'awis**: ئاوەڵـناو. هـەراشئـاوس؛ پاوەمانگ ≣ پابەماه

**تۆڕاندن / tořandin**: چاوگ. ڕەواندنەوە؛ ڕاونان ≣ رماندن

**تـۆڕک / tořik**: نـاو. ١. ☜ **تۆڵەکە ـ١** ٢. تـۆڕ؛ چەقەڵ ≣ ١. ☜ **تۆڵەکە ـ١** ٢. شُغال

**تـۆڕەوان / tořewan**: نـاو. ڕاوکـەری بـە تـۆڕ ≣ شکارچی با تور

**تۆڕی / tořî**: ناو. تۆڕ؛ تۆڕک؛ چەقەڵ ≣ شُغال

**تۆڕینە / tořîne**: ناو. تۆڕی چاو؛ شانەی هەسـتیار بە تیشک لە چاودا کە لە هەشت تـوێی لـە سـەر یەک پێکهـاتووە، حـەوتیان دەمارییـە و یـەکیان ڕەنگدانەیە ≣ شبکیەی چشم

**تـۆز / toz/**: نـاو. ١. غومـار؛ بابردەڵـەی زۆر وردی خاک ‹قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش‌مروور/ ئـەی پـەیکی شـارەزا بـە هـەموو شـاری شـارەزوور «نالی»› ٢.[کینایە] هەندێکی زۆر کەم ≡ ١. گـرد؛ غُبار ٢. ذره

▣ **تۆز تەکاندن**: ١. تۆزی شتێ لابردن ٢.[کینایە] کوتان و لێدان ≡ ١. غبارروبی کـردن ٢. کتـک زدن

**تۆز خواردن**:[مەجاز] ١. خۆڵ لـە سـەر نیشـتن؛ خاک لێ‌نیشتن ٢. شـتێکی (زۆرتـر بایەخـدار) بەبێ کەڵک داکەوتن ≡ ١. گرد گرفتن ٢. خاک خوردن

**تۆز کردن**: ١. تۆز هەستاندن؛ غومـار هەڵـکردن ٢.[کینایـە] ئـاژاوە نانـەوە ٣.[کینایـە] زۆر بەدەسـتوبـرد بـوون لـە کارێکـدا ≡ ١. غبـار برانگیختن ٢. آشوب برپـا کـردن ٣. غوغـا کـردن؛ خوش درخشیدن

**تۆز لێ‌هەڵنەسان**:[کینایە] هیچ لـێ‌هەڵـنەوەرین؛ ڕژد بوون ≡ خسیس بودن

**تـۆزی (پێـی) کەسـێک/ شـتێک نەشـکاندن/ نەتەقانـدن**:[کینایـە] بـە کەسـێک/ شـتێک نەگەیشتن؛ زۆر لە پێشەوە بـوونی شـت یـان کەسێک ≡ به گرد راه چیزی/ کسی نرسیدن

**تـۆزاڵ / tozał/**: ناو. هەنـدێکی زۆر کـەم ≡ بسیار اندک

**تـۆزاوی / tozawî/**: ناوەڵـناو. گـەرداوی؛ تـۆز لێ‌نیشتوو ‹لە بەر چاوم هەوا تۆزاوییە، کوردینە وریـا بن!/ بەرامبەر ناحەزی خۆتان وەکوو دیواری پۆلا بن! «سەیفولقوزات»› ≡ گردآلود

**تۆزبـاران / tozbaran/**: ناو. ئاخباران؛ تـەپ و تـۆز؛ تۆز و خۆڵ داگرتنی کەش ≡ بارش گرد و غُبار

**تۆزتـەکێن / toztekên/**: نـاو. ١. کـاری تەکانـدنی ئارامی شت بۆ لێ‌کردنەوەی تەپ‌وتـۆزی سـەری ٢.[مەجاز] کاری لێدان بە ئارامی ٣. ئامرازی تـۆز تەکاندن، پەڕۆیەکی بە قوڵـە دارێکـەوە بەسـراو، تۆزی سەر کەڵ‌وپەلی پێ دەتەکێنن. هـەروەها: **تۆزتەکێن کـردن** ≡ ١. گردگیری ٢. کتک‌کـاری بـە آرامی ٣. گردگیر

**تۆزقاڵ / tozqał/**: ناو. تۆزکاڵ؛ تۆزلانـە؛ تۆزلـقان؛ تۆسـقاڵ؛ تۆسـکاڵ؛ تۆزووڵـکە؛ نەختووکـە ≡ کمترین مقدار

**تۆزقاڵە / tozqałe/**: ☜ مسقاڵەزەڕە

**تۆزقاڵەیەک / tozqałeyek/**: ☜ تۆزقاڵێ

**تۆزقاڵێ / tozqałe/**: ناوەڵکار. تۆزکاڵێ؛ تۆسقاڵێ؛ تۆزلانەیەک؛ تۆزقاڵەیەک؛ تۆزقاڵێک؛ تۆزکاڵـێک؛ نەختێک ≡ اندکی

**تۆزقاڵێک / tozqałêk/**: ☜ تۆزقاڵێ

**تۆزکاڵ / tozkał/**: ☜ تۆزقاڵ

**تۆزکاڵێ / tozkałê/**: ☜ تۆزقاڵێ

**تۆزکاڵێک / tozkałêk/**: ☜ تۆزقاڵێ

**تۆزکەر / tozker/**: ناوەڵناو. گەردان ≡ غُبارانگیز

**تۆزلانە / tozłane/**: ☜ تۆزقاڵ

**تۆزلانەیەک / tozłaneyek/**: ☜ تۆزقاڵێ

**تۆزلقان / toziłqan/**: ☜ تۆزقاڵ

**تۆزووڵکە / tozûłke/**: ☜ تۆزقاڵ

**تۆزەلانە / tozełane/**: ☜ تۆزەلانینە

**تۆزەلانینـە / tozełanîne/**: ناوەڵـناو. تۆزەلانـەی؛ تۆزێکی کەم؛ نەختێک ≡ خیلی کم

**تـۆزین / tozîn/**: ناوەڵـناو. تـۆزاوی؛ خـۆڵاوی ≡ غبارآلود

**تۆزینە / tozîne/**: ناو. خۆڵەکەوە؛ بووڵ ≡ خاکستر

**تۆزێ / tozê/**: ناوەڵکار. نەختێک؛ تۆزێک؛ کەمێک ‹ئەگەر مومکین نەبوو دەنگێ لەمانە/ ئـەمن ڕازیم بـە تۆزێ ڕازیانە «ناری»› ≡ اندکی

**تۆزێک / tozêk/**: ☜ تۆزێ

**تۆژاڵ / tojał/**: ☜ توێژاڵ

**تۆژانەوە** / tojanewe/: چاوگ. ١. ☜ **تۆژینەوە** ٢. ☜ **تۆزانەوە**

**تۆژک** / tojik/: ☜ **تویخ ـ٢**

**تۆژگ** / tojig/: ناو. تویێ؛ سەرتویێ؛ تۆژی ☰ سرشیر

**تۆژەر** / tojer/: ناو. تۆژەرەوە؛ پەیجۆر؛ کۆڵەرەوە؛ هێرەکار؛ تۆژین؛ پەیدۆز؛ لێکۆڵەر؛ تۆژینەکار؛ پتەکەن ☰ پژوهشگر

**تۆژەرەوە** / tojerewe/: ☜ **تۆژەر**

**تۆژی** / tojî/: ☜ **تویخ ـ٢**

**تۆژین** / tojîn/: چاوگ. پشکنین ☰ جستجو کردن

**تۆژینەکار** / tojînekar/: ☜ **تۆژەر**

**تۆژینەوە** / tojînewe/: چاوگ. تێپەڕ. //تۆژیتەوە؛ دەتۆژییەوە؛ بتۆژەوە// تۆژانەوە؛ لێکۆڵینەوە؛ ورد بوونەوە و بە دوادا چوونی بەرە ـ بەرە بە مەبەستی ناسین و گەیشتن بە مەبەست ☰ کاویدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەتۆژینەوە

**تۆژێن** / tojên/: ☜ **تۆژەر**

**تۆسقاڵ** / tosqał/: ☜ **تۆزقاڵ**

**تۆسقاڵە** / tosqałe/: ئاوەڵکار. زا؛ زاد؛ زۆر کەم ☰ اندک

**تۆسقاڵێ** / tosqałêk/: ☜ **تۆزقاڵێ**

**تۆسکاڵ** / toskał/: ☜ **تۆزقاڵ**

**تۆسن** / tosin/: ئاوەڵناو. ١. سەرکێش؛ نارام ٢. جارز؛ تووڕە ☰ ١. توسن ٢. عصبانی

**تۆسنای** / tosnay/: ☜ **تەزاندن**

**تۆسنی** / tos(i)nî/: ناو. سەرگورزی؛ سەرسەختی ☰ لجاجت

**تۆسی** / tosî/: ناو. تویس؛ تویسوو؛ توێسی؛ توێسوو؛ تێسوو؛ تیسوێ؛ تسوێ؛ تیس؛ کەرتەشی؛ گیایەکی دڕکدارە دەخورێ و بنەکەی وەک ئەسپۆن کەف دەکا ☰ اشنان

**تۆسیای** / tosyay/: ☜ **تەزین**

**تۆشک** / toşik/: ناو. تۆشە؛ بژیوی سەفەر ☰ توشە

**تۆشکە** / toşke/: ناو. کرێژ؛ کرێش ☰ شورە

**تۆشڵ** / toşił/: ☜ **تویکڵ**

**تۆشۆرە** / toşore/: ☜ **تۆشەبەرە**

**تۆشە** / toşe/: ناو. توێشوو؛ توێشە؛ تیشە؛ تووشوو: ١. تفاق؛ ئازووخە؛ بژیوی پێداویست لە ماڵدا ‹زگ، تۆشە هەڵناگرێ «مەسەل»› ٢. تۆشک؛ زاد؛ زەواد؛ بژیوی سەفەر ‹من قوربەسەر خۆم، بێ تۆشە و زادم/ زار و زەعیف و بازارکەسادم «ئاوات»› ☰ ١. آذوقە ٢. توشە

**تۆشەبەرە** / toşebere/: ناو. توێشووبەرە؛ توێشوودان؛ توێشەبەرە؛ تۆشۆرە؛ تووربێنی تۆشە ڕاگوێزان ☰ خُرج؛ توشەدان

**تۆشەدان** / toşedan/: ☜ **تێشودان**

**تۆشەڵ** / toşel/: ☜ **تویکڵ**

**تۆف** / tof/: ناو. ١. هەڕەت؛ جەنگە؛ تاف ٢. کرێوە و باپێچ ‹چ شیرین زەرگەر هەوای تۆف سەرد/ گۆشوارە نە گۆش نەونەمامان کەرد «مەولەوی»› ٣. شوورە؛ وارشی باغ و بێستان ٤. تۆف؛ توو؛ تۆم ☰ ١. موسم؛ عنفوان ٢. کولاک ٣. دیوار دور باغ و بستان ٤. تخم

⊡ **تۆف نانەوە:** بشێوە ساز کردن ☰ فتنە برپا کردن

**تۆفاڵ** / tofał/: ناو. خڵتە؛ خلت ☰ تُفالە

**تۆفان** / tofan/: ناو. بادەوە؛ کرێوە؛ بەفر و بۆرانی هاوڕێ لەگەڵ با و باگژەی بەقەوەتدا ‹هەتا وەک ئاگری بن کان لەگەڵ یەک/ ئەگەر تۆفان بێ لەشکرتان بە پووشەک «حاجی قادر»› ☰ کولاک

**تۆفانە** / tofane/: ناو. پێشکە؛ مێشوولە ☰ پشە

**تۆفک** / tofik/: ناو. دانەی بۆدراو و برژاو لە سەر ساج ☰ دانەی بو دادە

**تۆفڵ** / tofił/: ☜ **تویکڵ**

**تۆفلە** / tofłe/: ناو. خونچەی گەڵادار ☰ جوانەی برگ درخت

**تۆفە / tofe/**: ناو. ١. کرێوە و باپێچ ٢. چینەی دیوار لە قوڕ ☰ ١. کولاک ٢. چین دیوار گلی

**تۆفیر / tofîr/**: ناو. جیاوازی؛ فەرق ☰ فرق؛ توفیر

**تۆڤ / tov/**: ناو. ١. تۆم؛ تۆو؛ توو ٢. چەشن؛ جۆر ‹چ تۆڤ› ☰ ١. بذر؛ تخم ٢. طور

⊡ **تۆڤ ئاڤێتن**: توو چاندن ☰ تخم کاشتن

**تۆڤی / tovî/**: ئاوەڵناو. بۆ توو ڕاگیراو ☰ نگهداری شده برای بذر

**تۆق / toq/**: ناو. ١. ئالقە؛ گەو؛ قەف ٢. تەپڵەسەر؛ بڵندترین جێگە لە هەر شتێ ‹تۆقی سەر› ٣. ملوانکەی یەکپارچە لە زێڕ ٤. پەڵە؛ کۆمەڵە و دەستە؛ پۆل (زۆرتر بۆ پەلەوەران) ٥. ☜ **تۆقەن** ☰ ١. حلقه ٢. بالاترین نقطه در هر چیز ٣. گردنبند زرّین ۴. دسته؛ گروه (پرندگان) ۵. ☜ **تۆقەن**

⊡ **تۆق کردن**: ماندوو بوون و وەستانی منال لە گریان ☰ خسته شدن کودک از گریه

**تۆقان / toqan/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //تۆقای؛ دەتۆقێی؛ بتۆقە// ١. تەقیان، تەقین؛ تەقینەوە ٢. لە ترسان زراو چوون و مردن ٣. ترسیان؛ ترسان ☰ ١. منفجر شدن ٢. زهره‌ترک شدن ٣. ترسیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: تۆقاو/ چاوگی نەرێنی: نەتۆقان

**تۆقاندن / toqandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //تۆقاندت؛ دەتۆقێنی؛ بتۆقێنە// تۆقانن؛ تۆقنای: ١. تەقاندن؛ ترەکاندن ٢. زراو بردن؛ زۆر ترساندن ☰ ١. منفجر کردن ٢. زهره‌ترک کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەتۆقاندن

**تۆقانن / toqanin/**: ☜ **تۆقاندن**

**تۆقای / toqay/**: چاوگ. تۆقنای؛ تۆقان؛ زۆر ترسان ☰ زهره‌ترک شدن

**تۆقتۆقە / toqtoqe/**: ناو. فیشەکەشێتە؛ تەقەمەنی شادی ☰ فشفشه

**تۆقتۆقیلە / toqtoqîle/**: ناو. ١. گیایەکە بەرەکەی ناوبەتاڵە و بە دەست دەیگوشن تەقەی دێ ٢. تەقەمەنی بچووکی منداڵان لە جێژن و شاییدا ☰ ١. گیاهی است ٢. از ابزار آتش‌بازی کودکان

**تۆقلە / toqle/**: ناو. تووقاڵە؛ تووقالە: ١. پۆڕگ؛ زیپکەی پڕ ئاو ٢. بڵق؛ بلۆق؛ تەقلە؛ پەقژ؛ بۆفرە؛ گومەزە؛ گۆمەزە؛ هەک؛ پەقویشک؛ پەقیشک؛ گلۆپە؛ گۆیژەی هوڵۆڵی نێو تراو ‹تۆقلەی سابوون› ☰ ١. تاول ٢. حُباب

⊡ **تۆقلە کردن**: ١. پۆڕگ کردن ٢. بڵق تێکەوتن ☰ ١. تاول زدن ٢. حباب کردن

**تۆقلەزەرات / toqlezeřat/**: ناو. نوقلەکوردی؛ جۆرێ زەڕاتە کە بە برژاندن هەڵدەتۆقێ و دەخورێ ☰ چُسفیل؛ ذرت بوداده

**تۆقنای / toqnay/**: ☜ **تۆقاندن**

**تۆقە / toqe/**: ناو. تەوقە؛ دەست و موشتاق ☰ عمل دست دادن

**تۆقەدیوار / toqedîwar/**: ناو. دیوارێک لە پارچە بەرد کە بە قوڕ هەڵیدەچنن و لە ژێرەوە ئەستوورە و هەتا بەرز دەبێتەوە، تەسکتر دەبێت، بۆ حەساری باخ و خانووی دروست دەکەن ☰ دیوار سنگی

**تۆقەسەر / toqeser/**: ناو. ١. بڵندترین جێ؛ بەرزایی هەرەبەرز ٢. کەفاک؛ لەوە؛ بەچگ؛ بەچک؛ کات؛ کاتک؛ بۆلی؛ تۆقانە؛ تەوقسەر؛ تەپڵی سەر؛ تەختانی بانی سەر ☰ ١. بالاترین نقطه ٢. تارکِ سر

**تۆقەگوڵ / toqeguł/**: ناو. شاپەسەند؛ تەوقەگوڵ؛ گوڵی ئەو گیایە ☰ گُل شاه‌پسند

**تۆقەلان / toqełan/**: ناو. شرکەلان؛ پارچەلان؛ ئەو شوێنەی ماشێنی شکاو و هەڵوەشاوەی لێ ڕۆ دەکەن ☰ اوراقی

**تۆقەن / toqen/**: ناو. پەڵە؛ لەت؛ تۆق ‹تۆقەنێ لە بەفرەکە توابووەوە› ☰ قطعه

**تۆقیان / toqyan/**: چاوگ. تۆقیای؛ لە ترسان مردن 🇮🇷 زهرەترک شدن

**تۆقیای / toqyay/**: ☜ **تۆقیان**

**تۆقین / toqîn/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //تۆقای؛ دەتۆقی؛ بتۆقە// ١. تۆقیان ‹وا سۆزی دڵم ئاگری بەر داوەتە جەرگم/ تۆقیوە، هەناسەش نەفەسێک هەمنەفەسم بێ «حاجی قادر»› ٢. ترەکان؛ تەقین ٣. ژیانەوەی کوێرەکانی؛ زیاد کردنەوەی ئاوی کارێز و کانی لە بەهاراندا ‹شریقەی هەورە گرمەی ڕەعدە هاڕەی ئاوە هاژەی با/ هوجوومی لەشکری سێلاوە جەنگەی کانی تۆقینە «؟»› 🇮🇷 ١. زهرەترک شدن ٢. منفجر شدن ٣. جوشیدن (آب قنات و چشمەهای خشکیدە در بهار)

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: تۆقیو/ چاوگی نەرێنی: نەتۆقین

**تۆقیو / toqîw/**: ☜ **تەقیو ـ١**

**تۆک¹ / tok/**: ☜ **توێکڵ**

**تۆک²**: ئاوەڵناو. ١. ☜ **تات²ـ١** ٢. تۆکمە و هیچ کاری لێ نەکەر 🇮🇷 ١. ☜ **تات²ـ١** ٢. مُحکم و غیر قابل نفوذ

**تۆکز / tokiz/**: ئاوەڵناو. ترکزە؛ بڤە 🇮🇷 خطر

**تۆکلیجە / toklîce/**: ناو. گیایەکی وەک کەرتەشی خڕ و تووکنە، درووی نییە و زۆر بەرز نابێتەوە، وەک چای لێی دەنێن و بۆ ژانی جەستە باشە 🇮🇷 گیاهی دارویی

**تۆکڵ / tokił/**: ☜ **توێکڵ**

**تۆکمە / tokme/**: ئاوەڵناو. تیکمە: ١. تیکسمڕاوی پتەو ٢. ناوپڕ؛ دڵێپەڕ ٣. یەکپارچە و پتەو ‹لە هەولێر پلانێکی ئەمنی تۆکمە بۆ جێژن دادەنرێت› 🇮🇷 ١. قد کوتاه چاق و نیرومند ٢. توپُر ٣. مُنسجم

⊡ **تۆکمە کردن**: یەکپارچە و پتەو کردن ‹تۆکمە کردنی بەشی کۆمەڵایەتی و لاواز کردنی حکوومەت› 🇮🇷 منسجم کردن

**تۆکمەچی / tokmeçî/**: ناو. شیرگەر؛ وەستای چەکسازی 🇮🇷 اسلحەساز

**تۆکمەیی / tokmeyî/**: ناو. تۆلایی؛ پڕی؛ خەستی؛ یەکەی نواندنی ڕادەی ماکی هەر شتێک لە سانتیمیترێکی چوارجادا 🇮🇷 چگالی

**تۆل / tol/**: ناو. پیزە؛ پز؛ پس؛ گۆدەک؛ پێزی؛ بەبلە؛ زایە؛ بەر؛ بێزە؛ بار؛ بوونەوەری برپڕەدار کە هێشتا بۆ ژیان لە دەرەوەی پزدانیدا گەشەی نەکردووە 🇮🇷 جنین

⊡ **تۆل دان**: کاول کردن 🇮🇷 ویران کردن

**تۆلاز / tolaz/**: ☜ **تۆلاز**

**تۆلازی / tolazî/**: ☜ **تۆلازی**

**تۆلتۆلە / toltole/**: ناو. جۆرێ کولێرەی تۆ ـ تۆ کە بە ڕۆن چەور دەکرێ 🇮🇷 نوعی نان گردە

**تۆلدار / toldar/**: ئاوەڵناو. ئاوس؛ زگپڕ 🇮🇷 باردار

**تۆلک / tolik/**: ☜ **تۆڵەکە ـ١**

**تۆلەترش / toletirş/**: ناو. مامڕێواس؛ گیایەکە دەرمانی کرمە 🇮🇷 گیاهی است ضد انگل

**تۆلێ / tolê/**: ☜ **تۆڵەکە ـ١**

**تۆڵ¹ / toł/**: ناو. تۆڵە؛ حەیف؛ قەرەبووی زوڵم 🇮🇷 انتقام

**تۆڵ²**: پێرۆ. ← **توندوتۆڵ**

**تۆڵا¹ / toła/**: ناو. دۆخی پێکەوە نووسان و زۆر ڕەق بوونی شتی ورد ‹تۆڵا گەزۆ؛ تۆڵا پەنیر› 🇮🇷 تودە

**تۆڵا²**: ئاوەڵناو. تۆکمە؛ یەکپارچە و پتەو 🇮🇷 منسجم و محکم

⊡ **تۆڵا کردن**: یەکپارچە و پتەو کردن ‹مادەی تانین لە سیواکدا پووک توند و تۆڵا دەکا› 🇮🇷 منسجم کردن؛ محکم کردن

**تۆڵاز / tołaz/**: ئاوەڵناو. تۆلاز؛ چاولەوەڕێن؛ چاوچلێس؛ چاوحیز؛ چاوباشقال؛ چاوباز؛ چەوباز؛ چاوچڕێن؛ چاڤلدەر؛ قۆق؛ خاوەن واز یان خووی چاوچڕێنی 🇮🇷 چشمچران

**تـۆلازی / tołazî**/: نـاو. تـۆلازی؛ چاولـەوەڕێنی؛ نەزەربازی؛ چاوچڕێنی؛ چاوچەرێنی؛ چـاوحیزی؛ چەوبازی؛ چاوەچڕێ؛ چیـەمچـارکی؛ چاوبـڕکێ؛ چەوپێسی؛ چەوچەو: ١. مەیل یا خووی تەماشا کردنی لەش، بەتایبەت ئەندامی جنسی لفی خـۆ ‹ئەو کابرایە، لە سەتا هەشتای هەڵبەستی لـە سـەر مەستی و بادە و سادە و تـۆلازی و نێـر و مـێبـازی و پەسـنبێـژی و فـرهاوێژی دەبڕێتـەوە «هـەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ٢. ڕوانین لە لفـی خـۆ بـۆ حەزی جنسی ☰ ١و٢. چشمچرانی

**تـۆلاش / tołaş**/: ناو. تۆلاشە؛ تراشە؛ تلاش؛ تلیش؛ تـەڕاش؛ تـەلاش؛ تلاشـە؛ تۆتـەلاش؛ تـوێلاش؛ تلێش: ١. تیزمالک؛ پارچـەی تـەنک لـە دار ٢. توێکلّی دار ☰ ١. پلمەی چـوب و سـنگ ٢. پوسـت درخت

**تۆلاش ـ تۆلاش / tołaş tołaş**/: ئاوەڵناو. چڵ ـ چڵ؛ پڕ لە تۆلاشە و تیزمالکی تێـژ ‹ڕێگاکـەی بـەردێ تۆلاش ـ تۆلاشە/ خۆم بە قوربـان ئـەو پـێ وە کلاشـە «فولکلۆر»› ☰ سیخ ـ سیخ

**تۆلاشە / tołaşe**/: ☜ **تۆلاش**

**تۆلاشەبەرد / tołaşeberd**/: ☜ **تلیشەبەرد**

**تۆلانەوە / tołanewe**/: چاوگ. تێنەپەڕ. داتۆلان؛ بڵ بوون؛ نەرم بوون بە هۆی زۆر گەیینەوە (بەتایبەت میوە) ☰ نرم شدن (به ویژه میوه) به علت زیاد رسیدن

**تۆلایی / tołayî**/: ☜ **تۆکمەیی**

**تۆڵدان / tołdan**/: ناو. هەڵپەز؛ منالّدان ☰ رحِم

**تۆڵـک / tołik**/: نانـێ چووچـک؛ کـولێرەی حاجیلەکلەک ☰ پنیرک

**تۆڵکە / tołke**/: ☜ **تۆڵەکە**

**تۆڵە / tołe**/: نـاو. ١. تۆڵ؛ قەرەبوو ‹لاوی ئازادیخوا ئەنالێنێ/ کەی بێ تۆڵەی ولاتی بستێنێ «قانع»› ٢. باتی؛ جیاتی ‹لە تۆڵەی قەلەمێکدا کتێبێکم پێ دا› ٣. بن؛ کچێنی ☰ ١. انتقام ٢. عوض ٣. بکارت

⊡ **تۆڵە دانەوە:** حەق دانەوە دەست ☰ انتقام پـس دادن

**تۆڵە ساندنەوە:** تۆڵە کردنەوە؛ حەق سـەندنەوە ☰ انتقام گرفتن

**تۆڵە شکاندن:** بـن پژانـدن؛ کچـێنی بـردن ☰ برداشتن بکارت

**تۆڵەئەستێن / tołe'estên**/: ☜ **تۆڵەسێن**

**تۆڵەبەتۆڵـە / tołebetołe**/: ئاوەڵـناو. چووبـەچوو؛ داربەدار؛ پاکلەپاک ☰ سر به سر

**تۆڵەدانـە / tołedane**/: نـاو. چێشـتی تـۆڕک و دانەوێڵە ☰ آش پنیرک و حبوب

**تۆڵەستێن / tołestên**/: ☜ **تۆڵەسێن**

**تۆڵەسـێن / tołesên**/: ئاوەڵـناو. تۆڵەئەسـتێن؛ تۆڵەستێن؛ تۆڵـەکەرەوە؛ حـەقیکـەرەوە ‹کوانـێ لاوی تۆڵەسێنم، بـۆچی ئەمـڕۆ گـوم بـوون؟/ کوانـێ شێری شێرشکارم ڕێگەیان گوم کردوون؟ «قانع»› ☰ انتقامجو

**تۆڵەشکاو / tołeş(i)kaw**/: ئاوەڵـناو. بـنپـژاو ☰ بکارت برداشته شده

**تۆڵەکە / tołeke**/: نـاو. تۆڵـکە: ١. تۆڵـک؛ تۆڵـێ؛ تووڵـە؛ تـەڕەتووڕە؛ تـۆڕک؛ پەپکـە؛ نانەحاجیلەگلەگ؛ گیایەکی گەلاپانە، دەخورێ ٢. سوێنە؛ تەشتی سواڵەت ☰ ١. پنیرک ٢. تشت سفالین

**تۆڵەکەرەوە / tołekerewe**/: ☜ **تۆڵەسێن**

**تۆڵەکەمارانە / tołekemarane**/: نـاو. مارتۆڵـەکێ ☰ افسنتین کبیر

**تۆم / tom**/: ناو. ١. تۆو؛ تۆڤ؛ تۆ ٢. توو؛ چنجـگ؛ چنچک؛ چنچە؛ چنجە؛ جنجە؛ ناوکـە؛ دەنکـەی بڕێ گیا و ڕوەک کە چەرەسە و دەیترووکێنن ☰ ١. تخم؛ بذر ٢. تخمە

⊡ **تۆم تکیان:** *(مەجاز)* تۆو تکـان؛ تـوو تکـان؛ کـام کردن؛ دڵ دەرهاتن؛ دڵ چوونە سەر شتێک و

دەس نەدانی ‹بەشی ئەو منداڵەش بدە با تۆمی نەتکێ› 🇮🇷 کام تلخ شدن

**تۆم تۆکانن:** چنجە تەقاندن 🇮🇷 تخمە شکستن

**تۆم داخستن:** ☜ **تۆم وەشاندن**

**تۆم وشانن:** تۆم داخستن؛ توو وەشانن؛ توو چاندن 🇮🇷 بذر افشاندن

**تۆماتێز** / tomatêz/: ☜ **تەماتە**

**تۆمار** / tomar/: ناو. ۱. قاقەزی نووسراوی لوولدراو ‹ها وەختەن تۆمار عومرم کەران تەی/ هەرچی بادا باد، ها دیرەن سادەی! «مەلا حامیدی ئالیجانی»› ۲. کاری نووسین لە دەفتەردا ۳. کاری گواستنەوەی دەنگ یان وێنە بۆ سەر ڕووپەڕ، شریت، فیلم یان کەرستەیەک بۆ مانەوەی 🇮🇷 ۱. تومار ۲. ثبت در دفتر ۳. ضبط

⊡ **تۆمار کردن:** ۱. نووسین لە دەفتەردا ۲. زەبت کردن 🇮🇷 ۱. ثبت کردن در دفتر ۲. ضبط کردن

**تۆمارکراو** / tomark(i)raw/: ناو. نووشتا؛ نووسراو 🇮🇷 ثبت شده

**تۆمارگە** / tomarge/: ناو. ستریۆ؛ شوێنی تۆمار کردن 🇮🇷 استریو

**تۆمانج** / tomanc/: ☜ **تۆمەت**

**تۆماو** / tomaw/: ناو. شاوەت؛ ئاوی پشت 🇮🇷 منی

**تۆمپز** / tompiz/: ناو. ۱. سەرمەقلات؛ سەرمەقولات؛ سەرموقولانج؛ جقلمبە؛ کاری بە لینگە و قووچی خۆ هەڵگێڕانەوە ۲. مشتەکوڵە؛ مست 🇮🇷 ۱. پُشتک ۲. مُشت

**تۆمدان** / tomdan/: ناو. توربێن؛ تۆمەدانە؛ خورجی تۆودان 🇮🇷 توبرەی برزگران

**تۆمڕژیاگ** / tomřijyag/: ☜ **تۆوتکاو**

**تۆمقفە** / tomq(i)fe/: ناو. گیاچەورە 🇮🇷 گل‌مرو

**تۆمگیر** / tomgîr/: ناو. گیای بالووکبڕ 🇮🇷 گل ماهور

**تۆموەشێن** / tomweşên/: ☜ **تووچن**[1]

**تۆمو** / tomû/: ناو. دەرپێ؛ شواڵ 🇮🇷 تنبان

**تۆمە** / tome/: ناو. ۱. تۆم؛ توو؛ تۆڤ ‹تۆمەی سەر و گوڵ وەنەوشە و سونبوڵ/ شانا باخەوان ئەجەڵ نە تۆی گڵ «مەولەوی»› ۲. ڕەچەڵەک؛ تۆرەمە 🇮🇷 ۱. تُخم ۲. نژاد

**تۆمەت** / tomet/: ناو. تۆمانج؛ بوختان؛ بوختیان 🇮🇷 تهمت

**تۆمەتبار** / tometbar/: ناوەڵناو. بەرتاوان؛ تاوان وەپاڵدراو 🇮🇷 مُتهم

**تۆمەدان** / tomedan/: ناو. هێکدان؛ ئەندامی بەرهەمهێنەری خانۆکەی جینسی مێینە لە مۆرەداراندا 🇮🇷 تخمدان

**تۆمەدانە** / tomedane/: ☜ **تۆمدان**

**تۆمەرز** / tomerz/: ☜ **تمەز**

**تۆمەرە** / tomere/: ☜ **تورەکە**

**تۆمەڕۆ** / tomeřo/: ناو. ڕەگی ئاوی شاوەت 🇮🇷 مجرای منی

**تۆمەز** / tomez/: ☜ **تمەز**

**تۆمەزا** / tomeza/: ☜ **تمەز**

**تۆمەزن** / tomezen/: ☜ **تمەز**

**تۆمەس** / tomes/: ☜ **تمەز**

**تۆمەشان** / tomeşan/: ناو. کووز؛ هێڵ؛ بەشێک لە زەوی کە بە هێڵێک دیاری دەکەن بۆ توو وەشاندن و کێڵان 🇮🇷 بخشی از زمین کە با شیار شخم برای کشت مشخص شود

**تۆمەڵێ** / tomełê/: ☜ **تمەز**

**تۆن**[1] / ton/: ناو. تون؛ هەزار کیلۆ 🇮🇷 تُن

**تۆن**[2]: ناوەڵناو. چاوبرسی و تێرنەخۆر 🇮🇷 حریص

**تۆناژ** / tonaj/: ناو. بەندەنی ڕژد و ئەستەم 🇮🇷 کوه دشوارگُذر

**تۆنگ** / tong/: ناو. تۆنگە؛ پارچ؛ گۆزەڵە؛ دەفری ملباریک بۆ تراو 🇮🇷 تُنگ

**تۆنگە** / tonge/: ☜ **تۆنگ**

**تۆو / tow/**: ناو. تــوو؛ تــۆم: ١. تــۆ ‹ئـەو تــۆوەی ئەیچێنن بە نیازی پاک/ بەهەشت ئەڕوێنێ بۆ گشـت لە ڕووی خاک «گۆران»› ٢. دەنکی گوڵەبەڕۆژە ☰ ١. تخم؛ بذر ٢. تخمەی آفتابگردان

⊡ **تۆو تکان**: ☜ **تۆم تکیان**

**تۆوتکـــاو / towt(i)kaw/**: ناوەڵـــناو. تـــــۆوڕژاو؛ تۆمڕژیاگ؛ لە پیاوەتی کەوتوو ☰ ناتوانِ جنسی

**تۆوچێن / towçên/**: ☜ **توچن**[1]

**تۆوڕژاو / towř(i)jaw/**: ☜ **تۆوتکاو**

**تۆونە / towne/**: ناو. بەراز ☰ گراز

**تۆی / toy/**: ناو. زەماوەند؛ گۆڤەند؛ بـەزم و داوەتی بووک هێنان ☰ عروسی

**تۆیانە / toyane/**: ناو. نوقڵ و شیرینی کە دەگەڵ جیازی بووکدا دەینێرن ☰ نقـل و شـیرینی همـراه جهیزیه

**تو**[1] **/ tû/**: ناو. ١. تۆو؛ تۆم ‹تووت نەچاندووە، باسـی درەو مەکە! «مەسەل»› ٢. تۆو؛ تۆم؛ چنجە؛ ناوکە ٣. تفـی؛ تی؛ تیـت؛ شمـی؛ داری تـوو ‹شـنەی سێبەری داری گوێز و توو/ ئەسرێ ئـارەقی ڕێبـواری ماندوو «گۆران»› ٤. تفی؛ تی؛ تیت؛ تـووت؛ بـەری دارەتوو ٥. توووەفەرەنگی؛ تووت ☰ ١. بذر ٢. تخمه ٣. درخت توت ۴. میوەی توت ۵. توتفرنگی

⊡ **تووە چەرمگە**: ☜ **تووە سپی**

**تووە سپی**: تووە چەرمگە؛ تووی سـپی ☰ تـوت سفید

**تووە سورە**: ☜ **تووەسورە**

**تووە شیرازی**: جۆرێ تووی سپی ☰ نوعی تـوت سفید

**تووە فەرەنگی**: ☜ **توفەرەنگی**

**تووە وشکە**: تووی وشکەوەکراو ☰ توت خشک

⊡ **تو تکان**: ☜ **تۆم تکیان**

**تو چاندن/ چانن**: تۆو چاندن؛ توو وەشـاندن ☰ بذر افشاندن

**تو**[2]: ئاوەڵکار. هیچ ‹توو جاران› ☰ هیچ

**تو**[3]: جێناو. تۆ؛ جێناوی ڕووبـەڕووی تـاک ☰ تـو؛ ضمیر مفرد مخاطب

**توبەرە / tûbere/**: نـاو. ١. ☜ **تورەکە** ٢. ئالقەی دانەلغاو کە لچی ژێـرووی ئەسـپ دەگـرێ ☰ ١. ☜ **تورەکە** ٢. حلقەی زیرین دهنەی اسب

**توت**[1] **/ tût/**: ناو. ١. توو؛ تفی؛ بەری داری تـوو ٢. تووەفەرەنگی ☰ ١. توت ٢. توتفرنگی

**توت**[2]: دەنـگ. وشەی دەرکردنی سەگ ☰ کلمەی راندن سگ

**توتار / tûtar/**: ئاوەڵـناو. خوڵتەکەر؛ مەرایی‌کەر ☰ چاپلوس

**تـوتاک / tûtak/**: نـاو. ١. قـــومری؛ یاکـــەریم؛ کۆترەباریکـە ٢. ☜ **توتـەك -٢** ☰ ١. قُمـری ٢. ☜ **توتەك -٢**

**توتان / tûtan/**: ☜ **توتەکان**

**توتانن / tûtanin/**: چاوگ. ١. وە قسە هێنـان ٢. دوانـدن و جـاڕز کـردن ☰ ١. بـە حـرف آوردن ٢. سربەسر گذاشتن

**توتر / tûtir/**: ناو. سیکەتۆرە ☰ سنگدان مرغ

**توترک / tûtiřk/**: نـاو. توودرک؛ تووڕک؛ دڕی: ١. دارچکێکی دڕکاوی پەل-پەلە بـە گـەڵای پـانی بڕکە - بڕکـەی کولـکنی هێلکەییـەوە ٢. بـەری سوور، ئاودار و ترش و شیرینی ئەو بنچکە کە لـە تام و ڕەنگا وەک سوورەتوو دەچێ و دەخورێ ☰ ١. درخت تِمِشک ٢. میوەی تمشک

**توترکەسەر / tûtiřkeser/**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* لاسار ☰ لجباز

**تـوتک / tûtik/**: نـاو. ١. تیتـــگ؛ تووتەکۆڵـــە؛ تیتەکۆڵە؛ کوتتلک؛ کوتک؛ کوتکە؛ کووتە؛ فنقی؛ ختو؛ خوچوو؛ کۆک؛ گوجووک؛ کجووک؛ کچـوو؛ گجـــووک؛ گـــوجی؛ گوجیلـــە؛ تووتکەســـەگ؛ تیتکەسەگ؛ بێچووە سەگ ٢. سەوڵەی سەگ ٣.

تــووتی ٤. ڤایرووســی نەخۆشــی هــاری 🇮🇷 ١. تولـەسـگ ٢. نوالـەی سـگ ٣. طـوطی ۴. ویـروس بیماری هاری

**تووتکان** / tût(i)kan/: ☜ **تووتەکان**

**تووتکە** / tûtke/: نـاو. ١. تووتـک؛ تووتەکۆڵـە ٢. ڤایرووسی نەخۆشی هاری ٣. *[مەجاز]* ئۆقرە؛ ئـارام 🇮🇷 ١. تولەسگ ٢. ویروس بیماری هاری ٣. آرامش

◘ **تووتکە خواردن** *[مەجاز]* تووتکـە گـرتن؛ ئـارام گرتن 🇮🇷 آرام گرفتن

**تووتکە گرتن**: ☜ **تووتکە خواردن**

**تووتکەسەگ** / tûtkeseg/: ناو. تووتک؛ توولەسەگ؛ تووتەکۆڵە 🇮🇷 تولەسگ

**تووتکەکسۆک** / tûtkek(i)sok/: نـاو. تیلـە؛ تولـە؛ بێچووە سەگ 🇮🇷 تولەسگ

**تووتم** / tûtim/: نـاو. تومتم؛ تووتووم؛ توتم؛ تمـتم؛ داری سماق؛ داری ترش 🇮🇷 درخت سُماق

**تووتن** / tûtin/: ناو. تیتن؛ توتن؛ هێتووین؛ تەماکۆ؛ تەنبەکی: ١. بنەگیایەکی یەکساڵەی بۆن‌تونـدی گەڵاپانی گوڵ زەرد و سپییە، لە مەزرای تایبەتی خۆیدا بەرهەم دێ ٢. گەڵای ئەو گیایە کە وشک و ورد دەکرێ و بە جگەرە، قلیـان یـان سـەبیلە، دووکەڵەکەی هەڵدەکێشن 🇮🇷 ١. بوتەی توتون ٢. برگ توتون

**تووتنانە** / tût(i)nane/: ناو. بەشی خـاوەن ملـک لە تووتنی ڕەعیەت 🇮🇷 سهم اربابی از توتونکاری

**تووتنای** / tûtnay/: چاوگ. دواندن؛ وە قسە هێنان 🇮🇷 به حرف آوردن

**تووتنچی** / tûtinçî/: ناو. ئەوەی کار و باری تـووتن دەکا ‹لە ڕاتبە کردن بووم بە تووتنچی/ ئەگەر شـێت نـەبم لـە تـووتنم چـی؟! «مـوفتی پێنجـوێنی»› 🇮🇷 توتونچی؛ توتون‌کار

**تووتنەوان** / tût(i)newan/: نـاو. ڕەنجبـەری تووتن‌کێڵ ‹تووتنەوانێکی هەژارم / بێ‌خانوو و زەوی و زارم «مەلا ئاوارە»› 🇮🇷 توتون‌کار

**تووتوفەراقەت** / tût û feraqet/: ناو. یارییەکی منداڵانە وەک چاوشارەکێ 🇮🇷 از بازی‌های کودکان

**تووتوک** / tûtûk/: ناو. بۆڕی؛ کەڕەنا 🇮🇷 کرنا

**تووتوم** / tûtûm/: ☜ **تووتم**

**تووتە**[1] / tûte/: ناو. ١. قامکـە چکۆلـە ٢. *[منداڵانە]* کاری دانیشتن ٣. سەگ ٤. بێچـووی سـەگ ٥. خاڵ؛ نیشان ٦. زێـدە گۆشـت لـە چـاو یـان لـە پێڵووی چاودا 🇮🇷 ١. خنصر ٢. عمل نشستن ٣. سگ ۴. تولەسگ ۵. خال ۶. گوشت اضافی در چشم یا پلک

◘ **تووتە کردن** قنگەنشـینە بـوون؛ فێرەدانیشـتن بـوونی منـداڵ ‹ئۆخـەی کـوڕی مـن تووتـەی کردووە› 🇮🇷 برنشستن کودک

**تووتە**[2]: دەنگ. وشەی دەرکردنی سەگ 🇮🇷 چیخە؛ کلمەی راندن سگ

**تووتەسەگ** / tûteseg/: نـاو. تولـە؛ کووتـە 🇮🇷 تولەسگ

**تووتەک** / tûtek/: نـاو. ١. چووزەڵـە؛ دووزەڵـە ٢. تووتـاک؛ توتـاک؛ توتـەک؛ قڕاوکـە؛ تـاق‌تـاق؛ حەق‌حەق‌کەرە؛ تاق‌تـاق‌کـەرە؛ تـاک‌تـاک‌کـەرە؛ هوموکەرە؛ قڕاکە؛ پەلەوەرێکی بچووکە بە پـەڕی خۆڵەمێشی و دەنگی ناخۆشەوە، مێروو دەخـوا و زۆرتر شەوانە دەخوێنێ ٣. نەرمەنایە 🇮🇷 ١. مزمـار ٢. مرغ حق ٣. نوعی نی زبانەدار

**تووتەکان** / tûtekan/: چاوگ. تووتـان؛ تووتکـان؛ هەڵترووشکان؛ هەڵتووتەکان؛ وە چینچک نیشتن 🇮🇷 چُمباتمه زدن

**تووتەکۆڵە** / tûtekołe/: نـاو. تووتکەسـەگ؛ تیتەکۆڵە 🇮🇷 تولەسگ

**تووتەڵە** / tûtełe/: ناو. تووتکەسەگ 🇮🇷 تولەسگ

**تووتەڵەسەگ** / tûtełeseg/: نـاو. گجـووک؛ گوجووک؛ گوجی؛ تووتکەسەگ 🇮🇷 تولەسگ

**تـووتی / tûtî/**: نـاو. پەلـەوەرێک بـە پـەڕ و پـۆی ڕەنگامە، دەنووکی کوڵ و کووڕ، لاقـی ئەسـتوور، دوو قامک لە پێش و دوان لە دواوە کە دەنگیـان بەرزە و بڕێکیان دەمەلاسکە دەکەنەوە ≡ توتی

**تووتیا / tût(i)ya/**: ناو. تۆتیا؛ ئوکسیدی سروشـتی کانزای ڕۆح کـە گەماربـەرێکی زۆر بـە قەوەتـە و پێشتر وەکوو دەرمانی چاو بە کار دەچوو ≡ توتیا

**تـووجی / tûcî/**: ناو. تووژی؛ تـوجی؛ کـاری بـەلاڤ کرن؛ پرش‌وبلاو کردن ≡ عمل پخش کردن

**تـووچان / tûçan/**: چـاوگ. فلیقانـەوە؛ تلیقانـەوە؛ تلیقیانەوە ≡ لە شدن

**تـــووچانن / tûçanin/**: چـــاوگ. فلیقاندنـــــەوە؛ تلیقاندنەوە ≡ لە کردن

**تـــووچن[١] / tûçin/**: نـــاو. تـــۆوچین؛ تـــووچین؛ تۆموەشێن ≡ بذرپاش

**تووچن[٢]**: ئاوەڵناو. لیچق؛ لینج؛ دەبیش ≡ لزج

**تووچێن / tûçên/**: ☜ **تووچن[١]**

**تووخن[١] / tûx(i)n/**: ☜ **تووکن**

**تووخن[٢]**: ئامراز. تخون؛ نزیک ≡ نزدیک

**تـووخۆره / tûxore/**: ناو. خەزایی؛ ئاینەمەل ≡ سـار صورتی

**توودایه / tûdaye/**: نـاو. ئـەو شـیعر و گۆرانییـەی کابانی شیردۆش لە کاتی مانگا دۆشـیندا دەیڵـێ ≡ شعر و آهنگی که شیردوش هنگام دوشـیدن گـاو زمزمه می‌کند

**توودرک / tûdiřk/**: ☜ **تووترک**

**توودۆکه / tûdoke/**: ناو. وردینەی کێوی؛ گیایەکی ئالفییە بۆ دەرمان ئەشێ ≡ قدومەی کوهی

**تـوودەره / tûdere/**: ناو. چرگ؛ چێرگ؛ زرەچێرگ؛ زرەمێشەسی؛ هۆوەرە؛ مێشەسی ≡ هوبره

**توور / tûr/**: نـاو. ١. ترپ؛ ترپە؛ ترب؛ تێرپ؛ تـرەو؛ تفـر؛ تفـۆ؛ تـوویر؛ تـویر؛ تـووری؛ تـرەوی؛ گـۆڕ؛ بنـەگیایێکی یەکساڵـەیە، ڕیشـەکەی ئەسـتوور دەبێ و دەخورێ ٢. توربێن؛ خـورجی بچـووک؛ توورەکەی نان و تێشوو ≡ ١. تُرُب ٢. خُرجین

**تووراندن / tûrandin/**: چـاوگ. تێـەر. //تووراندت؛ دەتـــوورێنی؛ بتوورێنـــە// تووڕانـــدن؛ فیڕانـــدن؛ زگ‌چوونی زۆرتر ماڵات ‹ئەم گوێلکـە ئـەتوورێنێ› ≡ اسهال شدن دام

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەتووراندن

**تووربین / tûrbîn/**: ناو. ١. ئامێرێکی میکانیکی کـە بـە تـەوژمی ئـاو، بـا یـان گـاز هەڵدەسـووڕێ و موتۆرێـک دەخاتـە کـار ٢. ☜ **توورەکـه** ≡ ١. توربین ٢. ☜ **توورەکه**

**توورێن / tûrbên/**: ☜ **توورەکه**

**تـوورژیلک / tûrjîlik/**: نـاو. تەرزەلووکـە؛ گللێرکـە؛ تەرزەی ورد ≡ تگرگ ریز و خشک

**تـوورک / tûrik/**: نـاو. توورەکـەی چکۆلـە؛ کیسـە قوماشی گوشاد ≡ توبرەی کوچک

**توورکی / tûr(i)kî/**: ئاوەڵـناو. بنەوەشی؛ جیددی ≡ جدی

**تـوورگ / tûrig/**: نـاو. چەقـەڵ؛ جانەوەرێکـە لـە تیرەی ڕێوی ≡ شُغال

**تووره / tûre/**: ناو. ١. مێورە؛ لکە دار مێو ٢. وێـژە؛ ئەدەبیات ≡ ١. شاخەی بریدەی تاک ٢. ادبیات

**توورەکانه / tûrekane/**: نـاو. باجـێ کـە گزێـر لـە ڕایەتی دەستێنێ ≡ باج اربابی

**توورەکـه / tûreke/**: نـاو. تـۆبرە؛ تۆبـەرە؛ تۆربـە؛ تۆمـەرە؛ توبـەرە؛ تـوەروە؛ تـوەرە؛ تـووربین؛ تـووربێن؛ تیـوەرە؛ تۆشـەبەرە؛ توربـە؛ قوماشـی هەڵدووراو بۆ شت تێ‌کردن ‹توورەکـەی سواڵـکەر هەرگیز پڕ نابێ «مەسەل»› ≡ توبره

**توورەکەڕێژ / tûrekeřêj/**: ناو. تەپۆڵکەی دەسـکرد ≡ تپەی دست‌ساز

**توورەلـەم / tûrelem/**: نـاو. گوڵـەگەنم و جـۆ کـە هێشتا نێر نەبووە (لە ساقەتەکەی نەهاتۆتـە دەر) ≡

خوشه‌ی گندم و جوی که هنوز در داخل ساقه و برگ قرار دارد

**تووره‌وان** / tûrewan/: ناو. ویـژه‌وان؛ تـۆره‌وان؛ تۆره‌مه‌ند؛ ئه‌دیب ☰ ادیب

**تووری** / tûrî/: ☜ **توور-۱**

**تووریسم** / tûrîsm/: ناو. گه‌شتیاری ☰ جهانگردی

**توور** / tûř/: ↓

▣ **توور دان:** فڕێدان؛ به قـه‌و هاویشـتن ‹شـه‌قت هه‌ڵدا له زێـڕ و جـل/ تـوورت داوه کلـدان و کـل «هێمن»› ☰ پرت کردن

**توور هه‌ڵدان:** بـه نهـێم بـۆ دوور هاویشـتن ☰ پرتاب کردن

**توورانـدن** / tûřandin/: چاوگ. ۱. تێ‌تووڕاندن؛ فوو به ئامرازی مووسیقا یان که‌ڵه‌شـاخدا کـردن ‹نـه بلوێرژه‌ن ده‌تووڕێنێ له بلوێر/ نه شـۆڕه‌ژن وڕینگـه‌ی دێ له به‌ر بێر «هێمن»› ۲. ☜ **داتووڕانـدن** ☰ ۱. دمیدن ۲. ☜ **داتووڕاندن**

**توورداو** / tûřd(i)raw/: ئاوه‌ڵناو. بـڕکـدراو؛ پـه‌رت کریاگ ☰ پرت‌شده

**توورک** / tûřik/: ☜ **تووڕک**

**تـووره** / tûře/: ئاوه‌ڵـناو. تویـڕه؛ ده‌مـارگرژ؛ ڕق‌هه‌سـتاو؛ که‌شـته‌نگ؛ قوشـقی؛ قوره‌ژیلـک؛ جه‌حنی؛ زرز؛ زوور؛ زوێر؛ زویر؛ دهۆ؛ به‌هـه‌جۆک؛ قه‌ڵس؛ ده‌هـری؛ سـڵ؛ ڕابـه‌ڵ؛ ڕاگـه‌ش؛ ئـه‌نگر؛ ده‌رهـه‌ڵ؛ ئـاگری؛ قیسـکه‌ته‌نگ؛ ته‌نگـه‌تیلک؛ ته‌نگه‌تیلکه؛ ته‌نگه‌تیله‌که؛ که‌ژته‌نگ؛ که‌شـته‌نگ؛ ئاڵه‌تی؛ جیجـه‌و؛ گونجـه‌ڕ؛ گونه‌وه‌جـه‌ڕ؛ جـڕه‌و؛ تووشی قه‌ڵسـی و ناڕه‌حـه‌تی. هـه‌روه‌ها: **تـووره بوون؛ تووره کردن** ☰ خشمگین؛ عصبانی

**توورەیی** / tûřeyî/: ناو. ڕک؛ ڕق؛ قه‌ڵسی ‹سفیده‌ی بـه‌یان سـه‌ر ڕه‌شـی شـه‌وکه‌ت/ هێنـده‌ی جێنـو دا تووره‌یی سره‌وت «پیره‌مێرد»› ☰ خشم؛ عصبانیت

**تووز** / tûz/: ناو. ۱. مترىه؛ موتوربه؛ پـه‌یوه‌نـدی دار ۲. کووزه‌ڵه؛ کووز ۳. ده‌قاق؛ ئوتـوو؛ چـرچ‌لابـه‌ر؛ ساف‌که‌ر ٤. داغ؛ داخ ٥. خزی؛ خلیسک ٦. لکی تازه‌ی دار ۷. بیچم و قه‌لافه‌ت ۸. ئاکار؛ ڕه‌وشت ‹زۆر پیاوێکی مـه‌رد و ڕه‌شـید و تـووز پیـاوه› ☰ ۱. پیوند درخت ۲. ترتیزک آبی ۳. اتو ۴. داغ ۵. لیـزی ۶. جوانه‌ی درخت ۷. ریخت؛ قیافه ۸. منش؛ اخلاق

▣ **تووز کردن:** متوربه کـردن؛ په‌یوه‌نـد کـردن ☰ پیوند زدن

**تووزان** / tûzan/: چـاوگ. ئێشـان و سـووتانه‌وه‌ی پێست ☰ درد و سوزش داشتن پوست

**تووزاندن** / tûzandin/: چاوگ. داغ پێوه‌نان؛ ئاسنی سووره‌وه بوو پێدا چزاندن ☰ داغ کردن

**تووزانـه‌وه** / tûzanewe/: چـاوگ. تووزیانـه‌وه؛ تۆژانـه‌وه؛ برژانـه‌وه و سـووزیانه‌وه‌ی بـرین یـان پێست ☰ دچار سوزش شدن

**تووزک** / tûzik/: ☜ **ته‌ڕه‌تیزه**

**تووزه‌ک** / tûzek/: ناو. ۱. ☜ **تـه‌ڕه‌تیزه** ۲. *[پلار]* چـڕ و چـاو ‹لاچـۆ! تماشـا تـووزه‌کی› ☰ ۱. ☜ **ته‌ڕه‌تیزه** ۲. سر و سیما

**تووزه‌له** / tûzele/: ناو. چووزه‌له؛ دووزه‌له ‹ده‌نگـی قه‌ڵپه‌زه‌ی ئاوی هه‌ڵدێره/ تووڕه‌ی تووزه‌ڵـه و ده‌نگـی بلوێره «حه‌قیقی»› ☰ مزمار

**تووزه‌ڵـه** / tûzeɫe/: نـاو. جووزه‌ڵـه؛ چووزه‌ڵـه ☰ نی‌لبک

**تووزیان** / tûzyan/: چاوگ. ۱. برژان و ژان کردنی پێست و زام ۲. خزیان؛ خلیسـکان ☰ ۱. سـوختن زخم ۲. لغزیدن

**تووزیانه‌وه** / tûzyanewe/: ☜ **تووزانه‌وه**

**تووژ¹** / tûj/: ☜ **تویژاڵ**

**تووژ²**: ئاوه‌ڵناو. تیـژ: ۱. تێـژ؛ برنـده ۲. تـوون (لـه چێژه‌دا) ☰ ۱. بُرنده ۲. تُند

**تووژاڵ** / tûjał/: ☜ **تویژاڵ**

**تووژک** / tûjik/: ☜ **تویژاڵ**

**تووژگ** / tûjig/: ناو. کێرد؛ خەنجەر ☰ خنجر

**تووژی** / tûjî/: ناو. تێژی: ١. بڕندەیی ٢. توونی ☰ ١. تیزی ٢. تُندی

**تووسکن** / tûskin/: ☜ **تیسکن**

**تووسە** / tûse/: ناوەڵناو. تەمەڵ؛ تەمبەڵ ☰ تنبل

**تووش**[١] / tûş/: ↓

⊡ **تووش بوون بە تووشی کەسێ/ شتێکەوە:** تووشیاری کەسێ/ شتێ بوون؛ ڕووبەڕوو بوون لەگەڵ کەسێ/ شتێکدا؛ هەڵتەقین/ تێکئاڵقان بە کەسێ/ شتێکەوە ‹هۆ کاکی ڕێبوار ڕێم کەوتە دۆڵێ/ تووشم بوو بە تووش هەوری‌لەکۆڵێ «فولکلۆر»› ☰ روبەرو شدن

**تووش کران:** خرانە نێو بارودۆخێکی نالەبارەوە ‹لە ئامێزی گەرم بێ‌بەش کراوم/ وەکوو تۆ تووشی ڕۆژی ڕەش کراوم «هێمن»› ☰ گرفتار شدن

**تووش کردن:** ١. گیرۆدە کردن ٢. ڕووبەڕوو کردن ☰ ١. گرفتار کردن ٢. روبەرو کردن

**تووش هاتن:** ١. ڕووبەڕوو بوون ٢. گرفتار و گیرۆدە بوون ☰ ١. برخورد کردن ٢. مواجە شدن

**تووش هێنان:** کردنە تووشەوە ‹ڕەبی قەت تووشمان نەهێنی عیللەتی قائیم‌مەقام/ ئێمە تابی حەرب و زەربی ... پاشامان نییە «شێخ ڕەزا»› ☰ مواجە کردن

**تووشی کەسێ/ شتێ بوون:** تووشیاری کەسێ/ شتێ بوون؛ گرفتار بوون بە کارێکەوە ‹تووشی تێغی نازی تۆ بووم تازە توخوا لێم گەڕێ/ با شەهادەت بێ بە ئەسبابی نەجاتم، ڕۆحەکەم! «بێخود»› ☰ گرفتار شدن

**تووشی گون‌ڕەشی خۆ هاتن:** ☜ **تووشی نێری شەش گون هاتن**

**تووشی نێری شەش گون هاتن:** تووشی گون‌ڕەشی خۆ هاتن؛ دوای ماوەیەک گوێ نەدان و ملهوڕی کردن، لەپڕ دژێکی بەهێز لێ پەیدا بوون ☰ پس از مدتی نفس‌کش نداشتن، ناگهان دشمنی قَدَر سر در آوردن

**تووش**[٢]: ناوەڵناو. ١. ئەستەم؛ سەخت ‹ڕێگایەکی تووشمان لەبەرە› ٢. زۆر سارد و بارانی (لەمەڕ هەواوە) ‹شەڕەبابە لە چیاکان و هەوا تووشە دەنا/ وەکوو شێتان دەمەویست ڕوو لە چیای ئەستەم کەم «هێمن»› ٣. گازگر و لەقەهاوێژ ٤. بەدفەڕ و بێ‌ئاکار ٥. داگیراو ٦. زۆر ساوراو (جگ) ☰ ١. دشوار ٢. سرد و بارانی ٣. چموش ۴. پرخاشگر و بداخلاق ۵. گرفته؛ بداخم ۶. ساییده (شتالنگ)

⊡ **تووش کردن:** ناخۆش کردن؛ شێوان (هەوا) ☰ منقلب شدن (هوا)

**تووشاڵ** / tûşal/: ☜ **تووێژاڵ**

**تووشتیرە** / tûştîre/: ناو. بزن؛ بز؛ کیەر ☰ بُز

**تووشک** / tûşik/: ناو. ١. ☜ **تووێژاڵ** ٢. کێرد؛ خەنجەر ٣. سەرما و سۆڵەی سەخت ٤. چوێشتیر؛ توێشتیر؛ گیسکی مێوینەی کەمتر لە دوو ساڵ ☰ ١. ☜ **تووێژاڵ** ٢. کارد؛ خنجر ٣. سرمای سخت ۴. بُزغالەی کمتر از دو سال

**تووشکە** / tûşke/: ☜ **ترشۆکە**

**تووشکەلە** / tûşkele/: ناو. کاوڕە مێ لە سەرەتای دوو ساڵاندا ☰ میش در ابتدای دو سالگی

**تووشماڵ** / tûşmał/: ناو. توژماڵ: ١. سەرپەرستی خێزان ٢. گزیر؛ کوێخا ☰ ١. سرپرست خانوادە ٢. کدخدا

**تووشوو** / tûşû/: ☜ **تۆشە**

**تووشی** / tûşî/: ناو. ١. جەنگنی و بەدفەڕی ٢. دۆخی سارد و بارانی بوونی هەوا ‹تەڕ و تووشی› ☰ ١. ستیزەجویی ٢. حالت سرد و بارانی بودن هوا

**تووشیار**[١] / tûşyar/: ☜ **تووش**[١]

**تووشیار**[٢]: ناوەڵناو. گیرۆدە؛ گرفتار؛ ئاوقا. هەروەها: **تووشیار بوون؛ تووشیار کردن** ☰ دچار

**تووشیاری** / tûşyarî/: ناو. گیرۆیی؛ گیرە؛ گرفتاری

≡ گرفتاری

**توفەرەنگی / tûferengî**/: ناو. تووەفەرەنگی؛ تووەزەمینە؛ تفەزەوینە؛ شیلک؛ شلیک؛ چیالیک؛ بنەگیایەکی خزۆکی گەڵا برکە-برکەیە، بە هۆشە گوڵ دەکاتەوە میوەیەکی سوورکاڵی مزری هەیە و لە کوردستان باش بەرهەم دێ ≡ توتفرنگی

**توقاڵە / tûqałe**/: ☜ **تۆقلە**

**توقاوڵە / tûqawle**/: ناو. بلۆق؛ پۆرگ؛ تۆقلە ≡ تاوِل

**توک[1] / tûk**/: ناو. ١. کوڵکە؛ موو ‹کۆرپە ئەگریجان تووک تاووس تار/ سەوزە کلافان چوون ڕشتەی زوننار «ئەحمەد بەگی کۆماسی»› ٢. تووز؛ ئاکار؛ ئەخلاق و ڕەوش ‹نە سۆزەی بلاوێنی میری خوناوەی بەهاری/ نە تووکی برای ڕێبواری/ لە کاسی خەوا، فێری ڕاسانی ناکەن «سوارە»› ٣. شادی و بەدەماغی ٤. نوەڕ؛ دوعای شەڕ؛ نزای خراپ ‹پشتت لە میللەت کردووە، پەنات بردووە بۆ دوژمن/ بەدرەقەی ڕێگای تۆ بێ با تووک و نزای پیاو و ژن «هێمن»› ٥. نووک؛ سەری باریکی شیش و دەرزی ٦. باڵدارێکی شەو بێدارە ≡ ١. پُرز؛ مو ٢. منش و اخلاق ٣. شادی و سرحالی ٤. نفرین ٥. نوک تیز هر چیز ٦. پرندەای شبخیز

⊡ **توک کردن**: ١. وردەپەڕ لێهاتنی جووجەڵە ٢. دوعای خراپ کردن ≡ ١. پر درآوردن جوجە ٢. نفرین کردن

**توک[2]**: پێرۆ. ← **تاکوتوک**

**توکان / tûkan**/: ☜ **تروکان -٢**

**توکاندن / tûkandin**/: ☜ **توکانن**

**توکانن / tûkanin**/: چاوگ. تووکاندن؛ ترووکاندن: ١. هێلکە بە دندووک شکاندن ٢. ئەزموونی هێلکە بە ددان ٣. داشکاندن؛ تەقاندن؛ دە توێکڵ دەرهێنانی کاکڵەی میوە ‹توو تووکانن› ٤. ورد کردنی کای دەغڵ لە کومباین و خەرمانکوت ≡ ١. شکستن تخم با منقار ٢. آزمودن تخم مرغ با دندان ٣. شکستن تخمە ٤. کوبیدن غلە

**توکڕونی / tûkřûnî**/: ناو. [کینایە] دۆخی خۆش ڕابواردن ≡ خوشگذرانی

**توکلێوەریو / tûklêwerîw**/: ناوەڵناو. ڕووتەڵە ≡ موریختە

**توکن / tûkin**/: ناوەڵناو. کوڵکن؛ تووخن؛ بەکوڵکە؛ تیسکۆ؛ تیسکن؛ تووسکن؛ ورگن؛ گوشین؛ جەژمی؛ بەکوڵکە؛ موینە؛ بەتیسک؛ زۆر بە موو یان تووک ≡ پشمالو؛ پرمو

**توکنە[1] / tûkne**/: ناو. جووجەڵەی هێشتا پەڕ دەرنەکردوو ≡ جوجەی پر در نیاوردە

**توکنە[2]**: ناوەڵناو. تووکن؛ کوڵکن ≡ پشمالو

**توکە / tûke**/: ناو. ١. کلوە بەفر ٢. وردە باران ≡ ١. دانەی برف ٢. نم - نم باران

⊡ **توکە کردن**: پرووشە کردن؛ پرووکە کردن ≡ نم - نم/ ریز-ریز باریدن

**توکەبەر / tûkeber**/: ناو. بەرەتووک؛ مووی بەرگەدە ≡ موی زهار

**توکەتوک / tûketûk**/: ناو. نمنمە؛ بارشتی هێدی-هێدی ≡ بارندگی نم - نم

**توکە ـ توکە / tûke tûke**/: ناو. تووکە - تووک؛ نمنمە ‹تووکە — تووکەی بەفر کوێستانان گردی/ جوانییەکەی عالەم یاری من بردی «فولکلۆر»› ≡ بارندگی نم - نم

**توکەسەر / tûkeser**/: ناو. پۆڕ؛ مووی سەر ≡ موی سر

⊡ **توکەسەر بون**: توورە بوون؛ ڕک هەستان ≡ خشمگین شدن

**توکەسەر کردن**: توورە کردن؛ ڕک هەستاندن ≡ خشمگین کردن

**توکەمردارە / tûkemirdare**/: ناو. تووکەمندارە؛ تووکی نەرم و وردی زەرنەقووت کە پاشان

هەڵدەوەرێ و پەڕوپۆ دەردەکا ☰ کُرک جوجه که بعداً پر جای آن را می‌گیرد

**تووکەمنداره / tûkemindare/:** ☜ **تووکەمرداره**

**توول / tûl/:** ناو. ۱. پارچەی زۆر تەنک و ناسک ۲. لکی ناسکی دار و گیا ۳. درێژایی ☰ ۱. پارچەی وال ۲. جوانەی گیاه ۳. طول

⊡ **توول دان:** درێژە دان ‹من چیم نووسیوه هەزار یەک نابێ/ توولی نادەمێ، ئیتر کۆتا بێ «قانع»› ☰ تفصیل دادن

**توولازم / tûlazim/:** ناو. نەخۆشی سیل ☰ بیماری سل

**توولنج / tûlinc/:** ناو. چیچک؛ کار و ڕەوتی تروشکان؛ هەڵتووتەکان ☰ چُمباتمه

**تووله[1] / tûle/:** ناو. ۱. لکی زۆر ناسکی یەکساڵە ۲. ☜ **تۆڵەکە ۱** ۳. بەچکەی سەگ، گورگ، ورچ و ... ‹توولەی بن ئاو سەگی خوێڕی!/ وات لێهات لە من بوەڕی؟ «گۆران»› ٤. ماری باریک ‹توولەمار› ٥. [پلار] بەچکە؛ منداڵ ☰ ۱. جوانەی نازک ۲. ☜ **تۆڵەکە ۱** ۳. بچەی برخی جانوران ۴. مار باریک ۵. فرزند

⊡ **سەگ بە تووله کردن:** [پلار] سەر پێ دانەواندن؛ ژێر کردن ‹یەعنی بە شەو ئەگەر سەگە، ئەیکەم بە تووله ڕۆژ/ ئەم سەگ بە تووله کردنە بۆ پاس و ڕاومە «بێخود»› ☰ ادب کردن

**تووله[2]:** ناوەڵناو. باری‌نەکراو (یەکسم بەتایبەت ئێستر) ‹قاتری تووله› ☰ چارپای باربر نشده

**توولەباب / tûlebab/:** ناو. سەگباب؛ باوکسەگ ‹ئەموت بانگی کەن ئەو توولەبابە/ ئیش و فەرمانی بۆچی خراپە؟ «قانع»› ☰ پدرسگ

**توولەڕێ / tûleřê/:** ناو. ڕچە؛ ولاخەڕێ؛ ڕێگەی باریک لە چیا و چۆڵ ☰ راه مالرو

**توولەزەڕە / tûlezeře/:** ناو. ڕێزەڵە ☰ تاجریزی

**توولەسەگ / tûleseg/:** ☜ **تووتکەسەگ**

**توولەسەوز / tûlesewz/:** ناو. توولی‌سەوز؛ گیایەکی بالابەرزە بەرەکەی لە گۆیژ دەکا ☰ گیاهی بلند با ثمری شبیه زالزالک

**توولەقاتر / tûleqatir/:** ناو. قاتری توولە؛ قاتری هێشتا باری‌نەکراو ☰ قاطر هنوز باربر نشده

**توولەک / tûlek/:** ناو. ۱. دۆخی وەرینی مووی لەش ۲. [پلار] تازەلاوی بێ‌موو ☰ ۱. ریزش مو و کرک ۲. جوان سادەرو

**توولەمار / tûlemar/:** ناو. ۱. ماری باریک ‹بە خاسە خاسە هاتە لامەوە/ هەر وەک توولەمار دایە پامەوە «فولکلۆر»› ۲. بەچکەمار ☰ ۱. مار باریک ۲. بچەی مار

**توولەنەمام / tûlenemam/:** ناو. نۆنەمام؛ نەونەمام؛ ڕیشە داری باریک و ڕاست و بەرزەباڵا ‹تۆم توولەنەمام عەسای دەسمی/ من کەسم نییە تۆ گش کەسمی «فولکلۆر»› ☰ نونهال باریک و بلند

**توولی / tûlî/:** ناو. وشتری تووکن و بەرگن درێژ ☰ شتر پشم‌دراز

**توولیایی[1] / tûlyayî/:** ناو. زێدەڕۆیی ☰ افراط

**توولیایی[2]:** ناوەڵناو. هلهلیایی؛ هەڵوپەڵبوو لە بەر کوڵانی زۆر ☰ له شده از پُختن زیاد

**توولینە / tûlîne/:** ناو. قەرتاڵەی زۆر چکۆلە ☰ سبدک تاس مانند

**توولیوم / tûlyum/:** ناو. تۆخمی کانزایی لە دەستەی لانتانیدەکان، بە ژمارەی ئەتومی ٦٩ و کێشی ئەتومی ١٦٨,٩٣ ☰ تولیم

**تووڵ / tûł/:** ناو. شووڵ؛ شوو؛ لکی باریک ‹شنەفتم گیانم، باڵا تووڵ نەی!/ ئیرادەت کەردەن چەنی خەستەت بەی «مەولەوی»› ☰ ترکه

**تووڵبڕ / tûłbiř/:** ناو. [کینایە] کار و ڕەوتی خۆ گێل کردن. هەروەها: **تووڵبڕ کردن** ☰ خود را به آن راه زدن

**تووڵتەکن / tûłtekin/:** ناو. ڕەزبەر؛ کەوچەرین ☰

مهرماه

**تۆڵکێش / tûłkêş/**: ناو. کار و ڕەوتی ژێر خاک کردنی لکی نەبڕاوی داری مێو ☰ عمل خواباندن جوانەی مو

**تۆڵەپێچ / tûłepêç/**: ناو. چۆڵەپێچ؛ چۆڵەمەپێچ ☰ نوعی شکار روباه و خرگوش

**تۆڵەزەڕە / tûłezeře/**: ☜ ترێ‌مارانە

**تۆڵەکی / tûłekî/**: ناو. تانە؛ سەرکۆنە ☰ طعنە

**تۆڵەگزی / tûłeg(i)zî/**: ناو. شیرخشت؛ گزگەتووڵین ☰ شیرخشت

**تومک / tûmik/**: ناو. چەشتە؛ تامک؛ چەشە؛ چێشتە؛ خۆراکی فریودانی نێچیر ☰ طُعمه

**تومۆر / tûmor/**: ☜ تومۆر

**تون[1] / tûn/**: ناو. ١. توونخانە؛ هاتوون؛ ئاتوون؛ ئاگردانی گەرماو ٢. *[مەجاز]* بنی ئاگری جەحەننم ☰ ١. گلخن؛ تُون گرمابه ٢. دَرَک

◙ **تونی تەبەس**: ☜ **تونی تەتەر**

**تونی تەتەر**: تونی تەبەس؛ دەرەک؛ جەحەنم ‹جور استاد به ز مهر پدر/ خوێندنت ناوێ چش به توونی تەتەر «مەلا غەفوور»› ☰ درک؛ جهنم

**بە تون**: بە جەهەننەم؛ بە دەرەک ☰ به درک

**تون[2]**: پێرز. ← **تەفروتونا**

**تونا / tûna/**: ناوەڵناو. ١. فەوتاو؛ نەماو؛ لەبەین‌چوو ‹به بێ تەوحید و سنعەت ناتوانن جەنگێ بەرپا کەن/ بەبێ کەسبی هونەر، چۆن لەشکری بێگانە توونا کەن؟ «قانع»› ٢. ☜ **تەفروتونا** ☰ ١. نابود ٢. ☜ **تەفروتونا**

**توناو / tûnaw/**: ناوەڵناو. تێراو؛ پاراو ☰ سیراب

**توناوتون / tûnawtûn/**: ناو. توونایی؛ قڕی؛ نابووتی؛ نابوودی ☰ نابودی؛ فنا

◙ **توناوتون بون/ چون**: تووناوتوون چوون؛ بەیەکجاری فەوتان و ئاسەوار لێ نەمان ☰ نیست و نابود شدن

**تونایی / tûnayî/**: ناو. قڕی؛ نستی؛ نەماوی ☰ نابودی

**تونچی / tûnçî/**: ناو. ئاگرکەری ئاگردانی گەرماو ☰ تونتاب؛ آتش انداز

**تونخانە / tûnxane/**: ناو. ئاگردانی گەرماو ☰ گُلخن؛ تون حمام

**تونکە / tûnke/**: ناو. تنۆکە؛ دەرپێی زۆر کورتی ژێر پاتۆڵ و شالوار ☰ شورت

**تونەدار / tûnedar/**: ناو. دارچین ☰ دارچین

**تونەک / tûnek/**: ☜ **تنۆک**

**تونەگیا / tûneg(i)ya/**: ☜ **تونەگیواو**

**تونەگیواو / tûnegîwaw/**: ناو. توونیلە؛ توونەگیا؛ تەرخون ☰ ترخون

**تونەوان / tûnewan/**: ناو. ئاگرچی حەمام ☰ تونچی حمام

**تونی / tûnî/**: ☜ **تینو[2]**

**تونیایەتی / tûnyayetî/**: ☜ **تینویەتی**

**تونیلە / tûnîle/**: ☜ **تونەگیواو**

**تونیەتی / tûnyetî/**: ☜ **تینویەتی**

**توەخۆرە / tûwexore/**: ناو. خەزاییی؛ عەینەمەل ☰ سار ملخ‌خوار

**توەڕەشە / tûweřeşe/**: ☜ **تووەسورە**

**تووەسورە / tûwesûre/**: ناو. شاتوو؛ گاتوو؛ تووەڕەشە ☰ شاه‌توت

**تووەفەرەنگی / tûweferengî/**: ☜ **توفەرەنگی**

**تووێر[1] / tûwîr/**: ناو. ١. کیسەی قوماش؛ توورەکە ٢. ☜ **تور ١** ☰ ١. کیسەی پارچەای ٢. ☜ **تور ١**

**تووێر[2]**: ناوەڵناو. تورت؛ شەق ☰ تُرد

**تووێری / tûwîrî/**: ناو. چەقەڵ ☰ شُغال

**تووێز / tûwîz/**: ناو. کووز؛ کووزەڵە ☰ ترتیزک آبی

**تووێل / tûwîl/**: ناو. تووڵ؛ شوولک؛ شوولک؛ لکە

داری باریکی بڕاو 🇮🇷 ترکه

**تووێلزەڕین** / tûwîlzeřîn/: ناو. کۆلکەزێڕینـه؛ پەلکەڕەنگینه 🇮🇷 رنگین‌کمان

**تووێناواره** / tûwênaware/: ناوەڵناو. ئاواره 🇮🇷 آواره

**تە** / te/: جێناو. تۆ؛ توو؛ جێناوی دووهەم کەسی تاک 🇮🇷 تو؛ ضمیر مفرد مخاطب

**تەب** / teb/: ناو. تەو؛ تا؛ یاو؛ گەرمای زیادی لەش 🇮🇷 تب

**تەبا**[1] / teba/: ئاوەڵناو. ١. ئاشت؛ هێمن؛ نێوان‌خۆش ٢. جۆر؛ ساز؛ کۆک؛ خاوەن توانایی یان ئۆگرەتی بە هاوکاری، هاوڕێیی یان پێکەوە ژیان 🇮🇷 ١. آشت ٢. سازگار

**تەبا**[2]: ئامراز. دەگەڵ؛ ڕەگەڵ؛ پێرا 🇮🇷 با؛ همراهِ

**تەباخ** / tebax/: ناو. ١. مانگی هەشتەمی ڕۆمی ٢. تەبەق؛ سینی 🇮🇷 ١. ماه اوت ٢. سینی؛ طبق

**تەباخچە** / tebxçe/: ناو. قاوەسینی؛ سینی چکۆله 🇮🇷 سینی کوچک

**تەبار** / tebar/: ناو. تەباره؛ بارست؛ ڕاده 🇮🇷 حجم

**تەباره** / tebare/: ناو. ١. نێوان؛ لەمپەر؛ تیغە ٢. بارست؛ تەبار ٣. دەغلی گەیشتووی نەدووراو ٤. هەرزاڵ؛ پێڕک؛ جێگەی کەل‌وپەل دانان لە ڕەشماڵدا 🇮🇷 ١. حایل ٢. حجم ٣. غلەی رسیدەی درو نشده ۴. جای وسایل در سیاه‌چادر

**تەباشیر** / tebaşîr/: ناو. دەباشیر؛ گەچی نووسین 🇮🇷 تباشیر

**تەبانه** / tebane/: ناو. باگردێن؛ بانگلێر؛ بانگووش؛ باگردان؛ بانگردێن؛ باگوردێن 🇮🇷 بام‌غلتان

**تەبایی** / tebayî/: ناو. تەڤایی: ١. ئاشتی؛ نێوان‌خۆشی؛ سازشت؛ هێمنایەتی؛ هاش؛ کار و ڕەوتی دەس هەڵگرتن لە شەڕ و دوژمنایەتی یان ناتەبایی ‹هێندێکی بە یەک یەک و جودایی/ دەستێکی بە گەل بە دڵ تەبایی «هەژار»› ٢. جۆری؛ سازگاری؛ کۆکی 🇮🇷 ١. آشتی؛ صلح ٢. سازگاری

**تەبت** / tebt/: ناو. ئارامی؛ هێمنایەتی 🇮🇷 آرامش

**تەبتاندن** / tebtandin/: چاوگ. حەجماندن؛ دامرکاندن؛ ئارامی دان 🇮🇷 آرام کردن

**تەبتین** / tebtîn/: چاوگ. حەجمین؛ دامرکان؛ ئارام گرتن 🇮🇷 آرام گرفتن

**تەبر** / tebr/: ناو. تەور؛ تەوەر؛ بیور 🇮🇷 تبر

**تەبسی** / tebsî/: ناو. سینی بووچک؛ کەشەفەی چایی 🇮🇷 سینی کوچک

**تەبع** / teb'/: ناو. نەخۆشین بە هۆی خواردنی چەورایی زۆرەوە 🇮🇷 بیماری ناشی از مصرف چربی زیاد

⊡ **تەبع هەڵگرتن:** ئیشتیای خواردن هەبوون ‹جارێ تەبعە هەڵیناگرێ، پاشان دەیخۆم› 🇮🇷 اشتها داشتن

**تەبغە** / tebğe/: ناو. ١. زبڵدان ٢. کۆمای زبڵ و پەین 🇮🇷 ١. آشغالدانی ٢. تودەی زباله و پهن

**تەبقاندن** / tebqandin/: چاوگ. هەڵترەکان؛ ترەکاندن؛ تەقاندن 🇮🇷 ترکاندن

**تەبکاندن** / tebkandin/: چاوگ. ڕۆ چواندن؛ تەپاندن 🇮🇷 چپاندن

**تەبکین** / tebkîn/: چاوگ. ڕۆ چوون؛ تەپین 🇮🇷 چپیدن

**تەبگ** / teb(i)g/: ☜ تەعەو

**تەبلە** / teble/: ناو. بەرەو بان؛ بۆ لای ئاسمان 🇮🇷 جهتِ رو به بالا

⊡ **تەبلەی سەر:** تەپلی سەر؛ تەوق سەر 🇮🇷 فرق سر

**تەبۆ** / tebo/: ناو. گەنە؛ مچ؛ نۆژ؛ مێروویێکە بە ئاژەڵەوە دەنووسێ و خوێنیان دەمژێ 🇮🇷 کنه

**تەبوور** / tebûr/: ناو. شەنە؛ شەن 🇮🇷 افشون

**تەبەتۆر** / tebetor/: ناو. جاڵجاڵووکە؛ کاکڵەمووشان؛ جۆلاتەنە 🇮🇷 عنکبوت

**تەبەتە** / tebete/: ☜ تەبەنە

**تەبەر / teber/**: ناو. کـەڵلا؛ هەڵـمات؛ مەڕمـەڕ 🇮🇷 تیله

**تەبـەرزە / teberze/**: نـاو. ١. جـۆرێ خورمـا ٢. جۆرێ ترێ 🇮🇷 ١. نوعی خرما ٢. نوعی انگور

**تەبـەرزین / teberzîn/**: نـاو. تـەوەرزین؛ چـەکی تەورئاسا بە دەستی سوار و دەروێشەوە 🇮🇷 تبرزین

**تەبەش / tebeş/**: ناوەڵناو. ناوچاوان سـپی (ئـاژەڵ) 🇮🇷 پیشانی سفید (دام)

**تەبەق / tebeq/**: ناو. تەوەق: ١. تەبەک؛ یاڵتەبەق؛ تەباخ؛ شکەڤ؛ شکەڤگ؛ شکەڤـک؛ شـەکەویک؛ شکۆک؛ ئەشکەفک؛ شکەفک؛ ئەشـکەو؛ مزاخـە؛ سووهین؛ بەرگـەش؛ بەرکـەش؛ سـینی؛ خـوان؛ خوانچە؛ تەخنک؛ خاروفک؛ لەنگـەری؛ دەفـری دارینـەی تـەخت و لێـوارە کـورتی گـەورە کـە پیتەوای لە سەر دادەنێن و دەیخەنە سـەر سـەر ‹تەبەق پڕ بێ، با هەر قوڕ بێ «مەسەل»› ٢. تەبەقە؛ تەبەک؛ جۆرێ نەخۆشی سمی وڵاخی بـەرزە ٣. نهۆم؛ قات ٤. پەڕە؛ وەرەق ‹تەبەقێ کاغەزم هێنا و نامەکەم نووسی› ٥. پارچـە شیشـە ‹تەبـەقێکم بـۆ پەنجەرەکەمان کڕی› 🇮🇷 ١. طَبَـق؛ سـینی بـزرگ ٢. نوعی بیماری سُـم دام ٣. طبقـه؛ اشـکوب ٤. ورق ٥. قطعه شیشه

**تەبەقە / tebeqe/**: نـاو. ١. نهۆم؛ قـاتی خـانوو ٢. تەوەقە؛ نەخۆشی تەبـەق 🇮🇷 ١. طبقـه؛ اشـکوب ٢. نوعی بیماری سُم دام

**تەبەقەتڕانـە / tebeqet(i)řane/**: نـاو. *[شـوورەیی]* تەشبێ‌تڕانـە؛ تەشـبی‌تڕانـە؛ تـاوانی تـڕ کەنـدن ‹تەبەقەتڕانە گەڕانی تەبـەقێک چایـە› 🇮🇷 جریمـەی گوزیدن

**تەبـەک / tebek/**: نـاو. ١. نەخۆشـــی تەبـــەق ٢. تەشتی داریـنـی نانـدێن ٣. سـینی داریـن 🇮🇷 ١. نوعی بیماری سم دام ٢. تشت چوبی نگهداری نان ٣. سینی چوبی

**تەبەنـە / tebene/**: نـاو. تەبەتـە؛ تەوەنـە؛ دەرزی لێفە دروون 🇮🇷 سوزن درشت لحافدوزی

**تـەبیات / tebyat/**: نـاو. تەبیـەت؛ تەبیعـەت: ١. ئیشتیای خواردن ٢. پێکهاتـەی بنـەمایی کـەس یان شتێک 🇮🇷 ١. اشتها ٢. طبع

**تەبیعەت / tebî'et/**: ☜ **تەبیات**

**تـەپ[1] / tep/**: نـاو. ١. گـزی؛ گـەڕ؛ حیلـە ٢. فـێ؛ نەخۆشی فێداری ٣. گرد؛ تەپۆلکە ٤. کۆ؛ کۆمـا؛ تەپۆلکە ٥. سل؛ تۆپەڵەیەک پیسـی ٦. پـەلامار؛ هێرش ٧. غوبار؛ تۆز ٨. مژ؛ تەم ‹بگرمێنێ، تەپ و نم دابکا، بیکاتە شەست، هـەرگیز/ نەوەستێ قوڵـپی گریانی، نەوەستێ هەورەکەی پاییز «گـۆران»› 🇮🇷 ١. فریب ٢. صرع ٣. کُپه؛ تپه ٤. توده ٥. سـنده ٦. تـک؛ یورش ٧. غبار ٨. مه

⊡ **تـەپ دان**: ١. بە سەر یـەکا کۆمـەڵ کـردن ٢. پەلامار دان ‹نیوەشـەو ڕابـورد، تـەپم دا لـە کـۆ/ شەوگارم شەق کرد نەگەییم بە تۆ «فولکلـۆر»› 🇮🇷 ١. انباشتن ٢. یورش بردن

**تەپ دانە سەر**: لە ناخافڵ خۆ بە سـەردا دان 🇮🇷 شبیخون زدن

**تەپ لێدان**: فریو دان 🇮🇷 فریب دادن

**تەپ لێ نەپێکان**: *[کینایە]* تەپ لێ نەکوتان؛ های لـێ نـەبوون؛ هـیچ لـێ نـەزانین 🇮🇷 هِـر از بِـر نشناختن

**تەپ لێ نەکوتان**: ☜ **تەپ لێ نەپێکان**

**تـەپ[2]**: ناوەڵـناو. ١. *[پـلار]* تەمـەڵ لـە ڕۆیشـتن ‹قامکەگـەورەی ورگـزل، تـەوەزەل و تـەپ و فـل/ ئەیوت: ئاشنا نـاخوازم، لـە لاوازان جیـاوازم «هـەژار، *پێنج ئەنگوست*»› ٢. بێدەنگ؛ وس لـە ترسـان ٣. گران؛ قورس (بۆ گوێ) ‹گوێ تەپ› 🇮🇷 ١. تن لـش ٢. خاموش از ترس ٣. سنگین (گوش)

⊡ **تـەپ کردن**: بێدەنگ بوون لە ترسان 🇮🇷 خاموش شدن از ترس

**تەپ**[۲]: دەنگ. دەنگی کەوتنی شتی نەرمی قورس ‹تەپ! ها ترپەت دێ و لنگەوقووچ/ بۆی ئەکەویت دەعبای وەک حووچ! «گۆران»› ▤ تالاپ؛ تاپ

**تەپار / tepar**: ناو. تەپارک؛ ڕیخ و قوڕ کە دەمی کەنووی هەنگی پێ سواغ دەدەن ▤ سرگین و گِل اندودن دهانەی کندو

**تەپارک / tepark**: ☜ **تەپار**

**تەپاڵدان / tepałdan**: ناو. شوێنی تەپاڵە لێ دانان؛ هەماری تەپاڵە ▤ انبار نگهداری تاپاله

**تەپاڵە / tepałe**: ناو. تەپاڵێ؛ تاپاڵە؛ تەپکە؛ تەپک؛ تەپگ؛ تەپگە؛ تەپەڵۆک؛ ترولاق؛ تەریب؛ دەوە؛ لبان؛ سەپگ؛ قلاخ؛ قالاخ؛ قەلاخ؛ دەوە؛ کێویلە؛ کێولە؛ لبان؛ سەنێری پێژراو و وشکەوە کراوی چوارپێیان بۆ سووتەمەنی ▤ تاپاله

▣ **تەپاڵە پێژان**: دروست کردنی تەپاڵە لە شیاکە ▤ تاپاله ساختن

**تەپاڵەپێژ / tepałepêj**: ناو. کەسێ کە شیاکە دەپێژێ و تەپاڵە دروست دەکا ▤ کسی کە سرگین را تاپاله کند

**تەپاڵەدەشتی / tepałedeştî**: ناو. سان ▤ سرگین خشک

**تەپاڵێ / tepałê**: ☜ **تەپاڵە**

**تەپان**[۱] **/ tepan**: ☜ **تەپین**

**تەپان**[۲]: ناو. تەپش: ١. ژێردەرانە؛ پاژنەی دەرگا ٢. داری جێگەی تەوەرەئاش ٣. تێلای گەلا کوتان ٤. چەپەری پشتیوانەی دەرگا ٥. بەردی قورسایی سەر دینگ ▤ ١. پاشنەی در ٢. چوب زیر قُطب آسیا ٣. چماق برگ‌کوبی ۴. پشتوانەی در ۵. سنگ بالای دنگ شالکوبی

**تەپاندن / tepandin**: چاوگ. تێپەڕ. //تەپاندت؛ دەتەپێنی؛ بتەپێنە// تەپانن؛ تەپنای: ١. شێلان، بە لاق یان هەرچی ٢. تووش کردن ٣. ئاخنین؛ بە زۆر و گوشار تێ کردن ٤. *[مەجاز]* کڵاو سەر نان ▤ ١. کوبیدن ٢. دچار کردن ٣. چپاندن؛ تپاندن ۴. فریب دادن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەتەپاندن

**تەپانن / tepanin**: ☜ **تەپاندن**

**تەپانە / tepane**: ناو. ١. تنۆکە؛ توونکە؛ دەرپێی کورت ٢. شریتی گرێدراو بە جەمسەری ڕایەڵەکان (لە کار و باری جۆلاییدا) کە لە سەری هاتوچۆ دەکا ▤ ١. تنبان کوتاه ٢. نوار تاربند جولایی

**تەپاو / tepaw**: ئاوەڵناو. ١. شێلدراو بە لاق یان هەر شتی دی ٢. ڕمیاو؛ ڕووخاو ٣. خەریکی ڕمیان ▤ ١. کوبیده شده ٢. فروریخته ٣. در شُرُف فروریختن

**تەپاوتل / tepawtil**: ناو. چۆنیەتی بەملاو بەولادا کەوتن ▤ تلو- تلو

▣ **تەپاوتل کردن**: پل/ تل دان ▤ تلو- تلو خوردن

**تەپاوکە / tepawke**: ناو. ئاوار ▤ آوار

**تەپای / tepay**: چاوگ. تەپین؛ دارمان ▤ فروریختن

**تەپتەپ / teptep**: دەنگ. ١. دەنگی تەپاندنەوە بە دەست یان قاچ ٢. تەپەتەپ؛ دەنگی غارغاران و هەڵبەزین ▤ ١و٢. تاپ ـ تاپ

**تەپتەپان / teptepan**: دەنگەناو. تەپەتەپ ▤ تالاپ ـ تولوپ

**تەپتەپە / teptepe**: ناو. ١. موتور؛ موتر؛ ماتۆڕ؛ دووچەرخەی موتوردار ٢. زەنگۆڵەی گەورە کە بە جێی زرینگە، تەپەی لێ دێ و لە ملی بزن یان مەڕی سەرگەلەی دەکەن ▤ ١. موتورسیکلت ٢. زنگولەی پیشاهنگ گله

**تەپتەپی / teptepî**: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی کەسێ کە تەنیا تەوقە سەری هەویزە ▤ ویژگی کسی کە فقط وسط سرش طاس است

**تەپچێور / tepçêwir**: ناو. تەکمیش؛ بنکۆڵی و

فش کردنەوەی بن دار و زەرعات ≡ عمل پی زدن و سست کردن خاک پای درخت و کشتزار

**تەپخ / tepx/**: ئاوەڵناو. داتەپیو؛ تەپاو؛ کاول ≡ فروریخته؛ ویران

⊡ **تەپخ بون**: داڕووخان؛ داتەپین ≡ ریزش کردن (دیوار)

**تەپخ کردن**: ڕووخاندن؛ ڕماندن ≡ ویران کردن

**تەپڕەش / tepřeş/**: ئاوەڵناو. فێڵباز؛ گەڕباز؛ حیلەساز ≡ ناروزن

**تەپس / teps/**: ناو. ١. کاری شێلان بە پێ ٢. کار و ڕەوتی تەپین؛ داکەوتنی دیوار ≡ ١. لگدمال ٢. فروریختن دیوار

⊡ **تەپس کردن**: /کنایە/ پێ بە سەردا ساوین؛ دەنگ دەرنەهێنان ‹هەر ئێوە کەتن بکەن و ئێمەش بۆتان تەپس ئەکەین› ≡ صدایش را در نیاوردن

**تەپساندن / tepsandin/**: چاوگ. ١. ڕاخستن؛ پان کردنەوەی ڕایەخ ٢. لێدان؛ کوتان ≡ ١. پهن کردن ٢. زدن

**تەپسە / tepse/**: ناو. کار و ڕەوتی داتەپین؛ ڕووخان ≡ ریزش

**تەپسی / tepsî/**: ناو. دەوری؛ دەفری پان و گوشاد بۆ چێشت تێکردن ≡ بُشقاب

**تەپسین / tepsîn/**: چاوگ. ١. ڕاخران؛ داخریان ٢. لێدران؛ کەوتنە بەر لێدانەوە ≡ ١. پهن شدن ٢. کتک خوردن

**تەپش / teps/**: ☜ **تەپان**[٢]

**تەپشت / tepişt/**: ناو. کۆشش؛ تەقالا ≡ کوشش

**تەپشوێ / teps(i)wê/**: ☜ **تەشوێ**

**تەپشۆ / tepşo/**: ☜ **تەشوێ**

**تەپشو / tepşû/**: ☜ **تەشوێ**

**تەپقین / tepqîn/**: چاوگ. قوپان؛ قوپیان (بۆ قاپ و مەنجەڵ و سەربان و...) ≡ گود افتادن

**تەپک / tep(i)k/**: ناو. ١. دەوە؛ تەپاڵە ٢. جۆرێ داوی ڕاو ٣. جۆرێ تەڵە ٤. گردوولکە؛ تەپۆڵکە ≡ ١. تاپاله ٢. نوعی دام شکاری ٣. نوعی تله ٤. تپه

**تەپکە / tepke/**: ناو. ١. داوی لە تەختە کوتراو بۆ ڕاوی مەل ‹بۆ نان و ئاوێ لەو خاک و ئاوە/ ماسی دەگرت و تەپکەی دەناوە «حەقیقی»› ٢. تەڵە لە دوو داری سەر قووڵکە بۆ ڕاوی کەروێشک ٣. دەوە؛ تەپاڵە ٤. پنجەگیا؛ بنەگیا ≡ ١. نوعی دام ٢. نوعی تلەی خرگوش ٣. تاپاله ٤. بوته

⊡ **تەپکە نانەوە**: داو نانەوە ≡ تله گذاشتن

**تەپکەچی / tepkeçî/**: ناو. ئەوەی تەپکە دەنێتەوە ≡ دامگذار

**تەپکەر / tepker/**: ئاوەڵناو. تەپۆ؛ فێڵەباز ≡ حیلەگر

**تەپل / tep(i)l/**: ناو. جێقامک؛ شوێن‌پەنجە ≡ اثر انگشت

**تەپلمۆس / tepilmos/**: ئاوەڵناو. تەپلۆس؛ تەمەڵ و تەوەزەل ≡ تنبل

**تەپلۆس / teplos/**: ☜ **تەپلمۆس**

**تەپلە / teple/**: ناو. ١. کڵاوی لباد ‹دەستەی خزمەتکار فیشەکدان لە مل/ بە چەفتە و مشکی سەر و تەپلە زل «گۆران»› ٢. جۆرێ کڵاوی ژنانە ≡ ١. کلاه نمدی ٢. نوعی کلاه زنانه

**تەپڵ / tep(i)ł/**: ناو. ١. دەهۆڵی لەشکر ‹نە بەیداغی هەیە نە تەپڵ و کووسی/ ئەمەندەی پێ کرا بێچارە، نووسی «حاجی قادر»› ٢. بان؛ سەر ≡ ١. طبل ٢. تارک

⊡ **تەپڵی بان**: ١. تەپڵێکی گچکە لە پێشکۆی زینیان دەبەست، کاتی وەڕێ کەوتنی لەشکر لێ دەدرا ٢. تەپڵی بچووک کە لە ڕاوەبازدا ئەیکوتن ≡ ١و٢. دو نوع طبل کوچک

**تەپڵی زرباگ**: /کنایە/ عەیب دەرکەوتوو ≡ تشت از بام افتاده

**تەپڵی سەر**: تەپڵەسەر؛ بانی سەر ≡ فرق سر

**تەپڵی شادی:** ☜ **تەپڵی شایە ـ۲**

**تەپڵی شایە:** ۱. تەپڵی سەرکەوتن لە شەڕدا ۲. تەپڵــی شــادی؛ تەپڵــی شــادمانی ◙ ۱. طبـل پیوروزی ۲. طبل شادی

**تەپڵی گوێ/ گوش:** تەپڵی گوش؛ پەردەی گــوێ ◙ پردەی گوش

▣ **تەپڵ دڕان:** *[مەجاز]* ئابڕوو چوون؛ عــەیب و عــار دەرکەوتن ◙ تشت از بام افتادن؛ رسوا شدن

**تەپڵدڕاو / tep(i)łd(i)řaw/:** ئاوەڵـــناو. *[کینایـــە]* دمەکـدڕاو؛ دمەکـدڕیاگ؛ نـاوزڕاو بــە خراپــە ◙ بدنام

**تەپڵژەن / tep(i)łjen/:** نـــاو. تـــەپڵلێـــدەر؛ دەهۆڵلێدەر ◙ طبال

**تەپڵک / tepłik/:** ناو. ۱. زگـدانی دیوار ۲. تەپڵی بچــووک ۳. بەرکەنــدال ٤. تیلمــە ئاســن یــان حەلەبی گەو کردنەوەی شتی شـکاو ◙ ۱. شـکم دادن دیوار ۲. طبل کوچک ۳. آبکند ۴. بند؛ نوار از آهن یا روی چینی بند زن

**تەپڵلێدەر / tep(i)łlêder/:** ☜ **تەپڵژەن**

**تەپڵۆس / tepłos/:** ئاوەڵـناو. تـــەپ؛ تەمـــەڵ؛ لەشگران ◙ تن‌آسا

**تەپلە / tepłe/:** ناو. کەلارە؛ دەفری لە شـیاکە ◙ ظرف ساخته شده از سرگین

**تەپلەسەر / tepłeser/:** نــاو. ۱. تـــەوقی ســـەر؛ تۆقەسەر ۲. بەرزترین شوێن لە هەر شــتێ ◙ ۱. تارک ۲. بلندترین نقطه

**تەپلەقوو / tepłeqû/:** ناو. دارێکـی لێـرەواره لــه بەلالووکەکێویلە دەکا ◙ درختی جنگلی شبیه آلبالو کوهی

**تەپلەک / tepłek/:** ناو. ۱. دەپی ســەر کوڵــەکە و بنمیچ ۲. تەپەکلاو؛ جەغزی ناوەڕاســتی تەقیلــە ۳. تــاس؛ جــۆرێ کــلاوی ژنــان ٤. ئادیــدانک؛ خولیدانک؛ خولیدان؛ ژێرسگار؛ دەفری ژێر سیگار ۵. کورسیلەی شت لە سەر دانان ٦. بانی گڵەبان نەکراو ۷. پف و هەڵمساوی گەچی دیوار بە هۆی نمەوە ◙ ۱. تختـەپارەی میـان سـتون و سـقف ۲. دایـرەی وسـط عـرقچین ۳. نـوعی کـلاه زنانـه ۴. زیرسیگاری ۵. میز عسلی ۶ بـام کاهگـل نشـده ۷. طبلک

**تەپڵیتۆپێن / tepłîtopên/:** ناو. گەمەیەکە منداڵ و لاو دەیکەن ◙ نوعی بازی

**تەپنای / tepnay/:** ☜ **تەپاندن**

**تەپوتل / tep û til/:** ناو. تەپوکـۆ؛ کــار و ڕەوتی تلەوە بوون و پل خواردن ◙ اُفت و خیز

**تەپوتۆز / tep û toz/:** ناو. تــۆز و غومــار؛ تــۆز و خۆڵ ◙ گرد و غبار

▣ **تەپوتۆز کردن:** تۆز و خۆڵ بەرپا کردن ◙ گــرد و غبار راه انداختن

**تەپوتــومان / tep û tûman/:** نــاو. ۱. تــۆزی خەســـتی داوەســـتاو ۲. تــەپودوومــان؛ مــژی داوەستاو ◙ ۱. گرد و غبار غلیظ و راکد ۲. مه غلـیظ و راکد

**تــەپوخ / tepux/:** نـــاو. ڕەوتی ڕەت بــــــردن؛ هەڵەنگووتن؛ ساتمە کردن ◙ سکندری

**تەپودو / tep û dû/:** ☜ **تەپودووکەڵ**

**تەپودووکـەڵ / tep û dûkeł/:** نـاو. تــەپودوو؛ دووکەڵ و تارمایی زۆر ◙ دود زیاد و غلیظ

**تەپودومان / tep û dûman/:** ☜ **تەپوتومان ـ۲**

**تەپوکۆ / tep û ko/:** ☜ **تەپوتل**

**تەپومژ / tep û mij/:** ناو. مژی خەسـت ‹ڕووناکــه بــەرێک ســەرێک تــەپومژ/ کــچ بەخشــه چــەلێک هەلێکی کوڕکوژ «هەژار، *مەم و زین*»› ◙ مه غلیظ

**تەپونم / tep û nim/:** ناو. باران و مـژ پێکـەوە ◙ هوای بارانی و مه‌آلود

**تــەپۆ[۱] / tepo/:** نـاو. مێشــوولەی لاق و دنــدووک درێژ ◙ نوعی پشه

**تەپۆ**[٢]: ئاوەڵناو. ١. نەفام و دەبەنگ ٢. لاڕوومەت شۆڕی بێددان 🇮🇷 ١. بی‌شعور ٢. گونە فرورفتە از نداشتن دندان

**تەپۆکە / tepoke**: ناو. تەپۆلکە؛ تەپۆڵکە؛ تەپۆنکە؛ گردوولکە؛ تەپکی نە زۆر بڵند 🇮🇷 تپەی کم‌ارتفاع

**تەپۆلکە / tepolke**: ☜ **تەپۆکە**

**تەپۆڵکە / tepołke**: ☜ **تەپۆکە**

**تەپۆڵەگیا / tepołeg(i)ya**: ناو. گیاگزگانە 🇮🇷 گیاه طاوسی

**تەپۆنکە / teponke**: ☜ **تەپۆکە**

**تەپە**[١] **/ tepe**: ناو. ١. تەپڵەکی ئارەخچن ٢. گرد؛ کێوی چکۆلە ٣. کۆما؛ ئەوی بە سەر یەکدا کەڵەکەی بەستووە 🇮🇷 ١. دایرەی وسط عرقچین ٢. تپه ٣. توده

⊡ **تەپە دان**: تەپە کردن؛ بە سەر یەکا کردن و لە سەر یەک هەڵچنین 🇮🇷 تودە کردن؛ برهم انباشتن

**تەپە کردن**: ☜ **تەپە دان**

**تەپە**[٢]: دەنگەناو. ١. دەنگی کەوتنی شتی نەرمی قورس ٢. دەنگی پای مرۆڤ 🇮🇷 ١. صدای افتادن شیئ نرم و سنگین ٢. صدای پا

**تەپەترە / tepet(i)ře**: ئاوەڵناو. [پلار] تایبەتمەندی ساوای تازەپێگرتوو کە دەکەوێ و هەڵدەستێتەوە 🇮🇷 حالت نوپا

**تەپەتەپ / tepetep**: دەنگەناو. تەپتەپ؛ دەنگی غارغاران و هەڵبەزین ‹تەپەتەپ مەکە! ئەو ماڵە نووستوون› 🇮🇷 تاپ ـ تاپ

**تەپەدۆر / tepedor**: ناو. تەپەدوور؛ هەوەدەڵ؛ چێوپەمە؛ چووپەمە؛ چۆپەمە: ١. تۆکڵەی بڕێ داری وەک بەڕوو کە پاش وشک بوونەوە، نەرم و پیف دەبنەوە و سووک و کون‌ـکون هەڵدەگەڕن ٢. تیکەیەک لەو چێوە کە بۆ سەرگرتنی بوتری دەبێ 🇮🇷 ١و٢. چوب‌پنبه

**تەپەدۆرە / tepedore**: ناو. فیبری سپی بۆ ڕاگرتنی سەهۆڵ و ساردەمەنی 🇮🇷 یونولیت

**تەپەدوور / tepedûr**: ☜ **تەپەدۆر**

**تەپەدووکەڵ / tepedûkeł**: ناو. دووکەڵی خەست و زۆر ‹ئەوە شەرارەی قرچەی تاسمە/ تەپەدووکەڵی شوێن هەناسەمە «پیرەمێرد»› 🇮🇷 دود زیاد و متراکم

**تەپەسوڕی / tepesuřî**: ناو. دڵەخورتێ؛ دڵەخورپە 🇮🇷 نگرانی

**تەپەسەر**[١] **/ tepeser**: ناو. لۆمە؛ سەرکۆنە 🇮🇷 سرزنش

**تەپەسەر**[٢]: ئاوەڵناو. سەرکوت‌کراو؛ سەرکۆنەکراو 🇮🇷 سرکوب شده

**تەپەسەری / tepeserî**: ناو. سەرکوتکاری؛ کار و ڕەوتی دانە ناو سەردا و سەرکوت کردن 🇮🇷 سرکوب

**تەپەسەنە / tepesene**: ناو. هەوڵ و تەقالای خۆڕایی و بێ‌خۆ 🇮🇷 تلاش بیهوده

**تەپەکراو / tepek(i)raw**: ئاوەڵناو. قلووژ؛ بە سەر یەکدا کۆوەبوو 🇮🇷 انباشته

**تەپەکڵاو / tepek(i)ław**: ناو. ١. پارچەی تەپڵەسەر داپۆش لە ئارەخچندا ٢. تەختەی گرۆڤەر لە سەر چالاکی خێوەت و ڕەشماڵ 🇮🇷 ١. دایرەی وسط عرقچین ٢. کلاهک ستون چادر

**تەپەڵۆک / tepełok**: ناو. تەپاڵە؛ تەپکە 🇮🇷 تاپاله

**تەپەوتەڵاڵ / tepewtełał**: ناو. تەپەویاڵ؛ کۆگا؛ قوتکەی (سروشتی یان دەسکرد) لە سەر زەوی ‹قەیس بی خەجاڵەت پڕ حوزن و مەلاڵ/ دیا چووپانێ جەو تەپەوتەلاڵ «خانای قوبادی»› 🇮🇷 تل؛ پشته

**تەپەویاڵ / tepewyał**: ☜ **تەپەوتەڵاڵ**

**تەپی / tepî**: ناو. تەمەڵی؛ تەنبەڵی 🇮🇷 تنبلی

**تەپیاس / tepyas**: ئاوەڵناو. پان؛ پەحن 🇮🇷 پهن

**تەپیاگ** / tepyag/: ئاوەڵناو. تەپیاو؛ ڕماو فروریخته

**تەپیان** / tepyan/: ☜ **تەپین-۱**

**تەپیاو** / tepyaw/: ☜ **تەپیاگ**

**تەپیای** / tepyay/: چاوگ. تەپان؛ تەپیان فروریختن

**تەپین** / tepîn/: چاوگ. تێنەپەڕ. //تەپیت؛ دەتەپی؛ بتەپە// تەپان: ۱. تەپیان؛ ڕووخان؛ بە سەر یەکا هاتنە خوار ۲. داتەپین؛ نەوی بوون و قوپانی شت ۳. *[مەجاز]* تێکچوونی لەشی مرۆڤ لە بەر پیری زۆر ٤. ڕزان و نەرم بوون (میوە) ۱. فروریختن ۲. گود افتادن ۳و۴. فرسودن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: تەپیو/ چاوگی نەرێنی: نەتەپین

**تەپیو** / tepîw/: ئاوەڵناو. ۱. ڕووخاو؛ ڕمیاگ ۲. *[مەجاز]* ورەنەماو؛ ورەبەرداو؛ خۆدۆڕیو ۳. *[مەجاز]* پیری تێکشکاو ٤. ڕزیو و گەنیو (بۆ شووتی و کالەک) ۱. فروریخته ۲. خودباخته ۳. فرسوده ۴. پوک شده (هندوانه و خربزه)

**تەترەک** / tetrek/: ناو. تەرزە؛ تەزرە؛ تەیرۆک تگرگ

**تەتک** / tetik/: ناو. ۱. لەپک؛ دەسکێش ۲. سمت و ساتان ۱. دستکش ۲. باسن

**تەتڵە** / tetłe/: ☜ **تەتڵەمیوە**

**تەتڵەزوان** / tetłez(i)wan/: ئاوەڵناو. لاڵەپەتە؛ تور الکن

**تەتڵەمیران** / tetłemîran/: ناو. تەتەڵەمیران؛ کرمێکی ئەستووری ڕەش و سپیی و کولکنە بە دوو ڕیز پاوە کرمی ابلق و کُرکدار

**تەتڵەمیوە** / tetłemîwe/: تەتڵە؛ کەلوو؛ کرمی ئاوریشم کرم ابریشم

**تەتڵەمێوە** / tetłemêwe/: ناو. قۆزاخە؛ کەلووی کرمی هاورێشم پیلەی کرم ابریشم

**تەتن** / tetn/: ناو. قوڕ؛ حەڕی؛ هەڕ؛ هەڕی؛ هەڕگ گِل

**تەتوەن** / tetwen/: ئاوەڵناو. بەردەلان؛ ڕێخەلان سنگلاخی

**تەتە** / tete/: ناو. ۱. بووکەڵەی منالان لە قوڕ یان لە هەویر ۲. پوور؛ مەت؛ پلە؛ میمک؛ خوشکی باوک ۳. خێشک بۆ زەوی لووس کردن ۱. عروسک گلی یا خمیری ۲. عمّه ۳. بَزَن

**تەتەبەخی** / tetebexî/: ناو. بووکڵە؛ بووکیلە؛ بوکلە عروسک

**تەتەپێچ** / tetepêç/: ناو. تەختەپێچ؛ کاری پێچاندنی ئێسکی شکاو بە تەختە آتل‌بندی استخوان شکسته

**تەتەر**[1] / teter/: ناو. نامەبەر؛ کەسێ نامە دەبا و دێنێ نامەبر

**تەتەر**[2]: ئاوەڵناو. شاتر؛ بەلەپا؛ بەپێ تُندرو

**تەتەران** / teteran/: ناو. وسمە: ۱. گیای وسمە ۲. ڕەنگی نێو گەڵای ئەو گیایە کە لە برۆ و سەری دەدەن ۱و۲. وسمه

**تەتەرپێچ** / teterpêç/: ناو. کار و ڕەوتی پێچانی لاق و بەلەک بە تیزماڵکە پەڕۆ و بەن لە کاتی سەفەر، لە بەفر و سەرمادا عمل پیچیدن ساق پا با نوار پارچەای

**تەتەری** / teterî/: ناو. سماق؛ ترشی سماق سماق

**تەتەشۆر** / teteşor/: ناو. تاتەشوار؛ جێگەی مردوو شۆردن سنگ یا تختەی مردەشوری

**تەتەڵە** / tetełe/: ناو. ۱. وەڕ؛ لەوح؛ دەب؛ دەپ؛ تەختە؛ لەوحە؛ پارچەتەختە، پارچە بەرد یان شتی ڕەق و تەخت بۆ لە سەر نووسین ۲. بەشێ لە جل‌وبەرگ کە کەلەکە و دەور و بەری دادەپۆشێ ۳. ڕوومەت و لاجانگ پێکەوە ٤. بووجاڕی؛ بەوەجاڕی؛ کاری پاک کردنی دەغڵ و

تووتن بە هەڵـتەکاندن ٥. گـت؛ ڕەوتی گـیرانی کوتوپڕی زمان کە دەبێتـە هـۆی خـراپ وتـنی وشـە یـان هەڵـە کـردنی ڕسـتە ٦. ئـامرازی هەوڕگەری؛ تەختە یا چەرمێکە بۆ لووس کـردنی هەوڕ و هیربار ٧. کەوانە؛ دۆخی لاتراسکە کردنی گوللە کە لە بەرد بکەوێ ☰ ١. لوح ٢. کمر لباس ٣. رُخسار ۴. بوجاری ۵. تُپق ۶ از ابزار کوزەگر ۷. کمانە (گلولە)

▣ **تەتەڵە کردن:** ١. هەڵتەکاندنی دەغڵ و تووتن بۆ پاک بوونەوە ٢. جۆڕیـان؛ هەڵـە کـردن لـە قسەدا و زمان تێکەڵ بوون ٣. بە هەڵە چـوون لە نیشانە ئەنگاوتندا ☰ ١. بوجاری کردن ٢. تُپق زدن ٣. بە هدف نزدن

**تەتەڵەکار** / tetełekar/: ناو. کۆسەکار؛ بووجـاڕ ☰ بوجار

**تەتەڵـەکاری** / tetełekarî/: نـاو. کۆسـەکاری؛ بووجاڕی ☰ بوجاری

**تەتەڵـەمیران** / tetełemîran/: نـاو. ١. ☜ تەتڵـەمیران ٢. گاڵـتە و گەمـە ☰ ١. ☜ تەتڵەمیران ٢. شوخی

**تـەتی** / tetî/: ناو. ١. سمت و سـاتان ٢. ئـاودەس ☰ ١. باسن ٢. مُستراح

**تـەتیاین** / tet(i)yayn/: چاوگ. دۆزینـەوە ☰ پیـدا کردن

**تەجە** / tece/: ☜ **تەگە**

**تەجەنەڕ** / tecener/: ☜ **تەگە**

**تەجیر** / tecîr/: ☜ **تەیمان**

**تەجیری** / tecîrî/: نـاو. هیزە؛ خیگ؛ خیگە؛ خیبـە ☰ خیگ

**تەح** / teĥ/: ☜ **تەحا**

**تـەحا** / teĥa/: دەنـگ. تـەح؛ ئـەححا؛ وشـەی سەیرمان ☰ وە

**تـەحت** / teĥt/: نـاو. ١. شـاخ؛ کێـوی لـە بـەردی لووس و بڵند ٢. لباد؛ نەوگ ☰ ١. صخرە ٢. نَمَد

**تەحتەقاپو** / teĥteqapû/: ☜ **تەختەقاپو**

**تەحتیل** / teĥtîl/: ناوەڵناو. تـەحتێل؛ پشـوودان ☰ تعطیل

**تەحتێل** / teĥtêł/: ☜ **تەحتیل**

**تەحرە** / teĥre/: ناو. جەنگەی گەرمای نیـوەڕۆ ☰ گرمای نیمروز

**تەحس** / teĥs/: ناوەڵناو. خلیسک؛ شەمت؛ خـز ☰ لیز

**تەحسین** / teĥsîn/: چاوگ. خلیسکان؛ شەمتین ☰ لیز خوردن

**تەحل** / teĥ(i)l/: ☜ **تاڵ**[٢]

**تەحلک**[١] / teĥlik/: ناو. تالـکە؛ جـۆرێ گرکـە کـە هەتا کاڵە تاڵە ☰ نوعی گرمک

**تەحلک**[٢]: ناوەڵناو. ڕەشتاڵە؛ ئەسمەری ئامـاڵ ڕەش ☰ سیەفام

**تەحلەسێف** / teĥlesêf/: ناو. خەیاردێمی؛ کوژاڵک؛ کاڵەکەمارانە ☰ هندوانەی ابوجهل

**تەحلەسێڤ** / teĥlesêv/: ناو. گوژاڵک؛ کاڵەکەمارانە ☰ هندوانەی ابوجهل

**تـەحلی** / teĥlî/: نـاو. ١. تاڵـی؛ تیبەڵـی ٢. ☜ **تاڵشک** ☰ ١. تلخی ٢. ☜ **تاڵشک**

**تەحلیشک** / teĥlîşk/: ناو. ١. ☜ **تاڵشک** ٢. ئـاوی تاڵ و سوێر ☰ ١. ☜ **تاڵشک** ٢. آب تلخ و شور

**تـەحین** / teĥîn/: نـاو. ڕاشـی؛ دۆشـاوی کـونجی؛ شیرەی کونجی ☰ شیرەی کُنجد

**تەخ** / tex/: دەنـگ. دەنگی گەڕاندنەوەی گاجووت لە سەر خەت ☰ حرف هدایت گاو شخم‌زن

**تەخار** / texar/: ناو. تەغار: ١. کێش و پێوانەیەکی دەغڵە بەرانبەری سی مـەن ٢. یەکـەی ژمـاردن بەرابەر بە سی دانە یا سی سەر ☰ ١. تغار؛ واحدی وزن، برابرِ سی من ٢. واحد شمارش، معادلِ سی رأس

**تەخاراو** / texaraw/: ناو. تەغاراو؛ کووپەی زەلامی

سەر ئاواڵە بۆ جێ ئاو ☰ تغار آب

**تەخت[1] / text/**: ناو. ١. چەرپا؛ قەرەوێڵە؛ چارپایەی لە سەر نووستن ٢. کورسی لە سەر دانیشتنی پاشا ☰ ١. تختخواب ٢. اریکەی سلطنت

**تەخت[2]**: ئاوەڵناو. ١. گۆڕ؛ ڕێک؛ بێ کەند و کلۆ و ڕاست ٢. بێ خوار و خێچی ٣. خاترجەم؛ ئارخەیان ☰ ١. هموار ٢. تخت ٣. خاطرجمع

▣ **تەخت(ی) ڕەوان**: کەژاوەی یەک چاوە کە بە چوار کەسان هەڵدەگیرێ ☰ تخت‌روان

⊡ **تەخت بوون**: ١. ڕاست بوونی کەندولەندی شوێنێ ٢. *[مەجاز]* تەواو تێک ڕووخان ☰ ١. هموار شدن کندولند ٢. به کلی ویران شدن

**تەخت کردن**: ١. ڕاست کردنی کەند و لەندی زەوینی ناڕاست و بەرز و نزم ٢. *[مەجاز]* خۆش و ساز کردن ٣. *[مەجاز]* وێران کردن ☰ ١. هموار کردن زمین ٢. مُهیّا ساختن ٣. ویران کردن

**تەختان / textan/**: ناو. گۆڕایی؛ تەختانی؛ تەختایی؛ هەردی ڕاست و تەخت ☰ زمین هموار

**تەختانی / textanî/**: ☜ تەختان

**تەختایی / textayî/**: ☜ تەختان

**تەختگا / textga/**: ناو. شوێنی جێگرتن و دامەزران ‹میوە کە کاڵ و ڕەق بێ لقی بەرزە تەختگای/ دەردی تەکامولە کە گەیی وا خەسار ئەبێ «پیرەمێرد»› ☰ قرارگاه

**تەختوبەخت / text û bext/**: ناو. دەسەڵاتداریی وێڕای کامەرانی و شادی ☰ قدرت و کامرانی

**تەختوتاج / text û tac/**: ناو. ١. *[مەجاز]* پاشایی؛ شایی ‹من گەداییم سەد ئەوەندەی حاکمی پێ خۆشترە/ نابەمە تابووتەوە خۆ داخی گەورەی تەخت‌وتاج «حەمدی»› ٢. نیشانەکانی پاشایی ☰ ١و٢. تاج‌وتخت

**تەختە[1] / texte/**: ناو. ١. دەپ؛ داری تاشراوی پان ٢. بەردی ڕاست و پان ٣. پارچەی کووتاڵ ٤. کوێنی ڕەشماڵ ٥. تاوڵی؛ کەرەسەیەک بۆ یاری دووکەسی کە سندووقێکی چێوییە لە ناوەڕاستەوە دەکرێتەوە و بە شێوەی دوو بەشی چوارگۆشە لە پاڵ یەکتریدا جێ دەگرن و هەرکام لە یاریکەران ١٥ مۆرەی یەکڕەنگیان هەیە، بە نۆرە تاس هەڵدەخەن و گەمە دەگەڕێنن ‹چەرخ چەپ وە ڕاس نە ڕووی تەختەی دەرد/ مۆرەی بەد شانا چەواشەی چەپگەرد «مەولەوی»› ☰ ١. تختەی چوبی ٢. تختەسنگ ٣. تختەی پارچە ٤. پارچەی سیاه چادر ٥. تختەنرد

▤ **تەختە دان**: دەپی دارین ☰ تخته

**تەختە[2]**: ئاوەڵناو. داخراو؛ گاڵەدراو (دووکان و بازاڕ و ...) ☰ بسته؛ تعطیل (دکان و بازار و ...)

⊡ **تەختە کران**: گاڵەدران ☰ تعطیل شدن

**تەختە کردن**: ١. گاڵەدان؛ بەستن ٢. *[مەجاز]* دەست بە سەر هەموو شتێکدا گرتن ☰ ١. تعطیل کردن ٢. تخته کردن

**تەختەبەرد / texteberd/**: ناو. بەردی پان و ساف ☰ تختەسنگ

**تەختەبەن / texteben/**: ناو. تەختەبەند: ١. کەت؛ تەختی لە تەختە و چوارگۆشە و گەورە بۆ لە سەر نووستنی هاوینان ٢. نەردێ؛ محەجەری ☰ ١. کت ٢. نرده

**تەختەبەند / textebend/**: ☜ تەختەبەن

**تەختەپۆش / textepoş/**: ناو. ١. نۆین؛ سەنگ‌پۆشی ناوەڕۆ ٢. تەختەبەندی میچ ☰ ١. سنگفرش آبراه ٢. پروار؛ تختەهای سقف‌پوش

⊡ **تەختەپۆش کردن**: داپۆشانی میچ بە تەختە ☰ پوشیدن سقف با تخته

**تەختەپووت / textepût/**: ناو. مۆریانە؛ مۆرانەی دارخۆر ☰ موریانه

**تەختەپیتی / textepîtî/**: ناو. غەریبسنجان؛ جووجوو ☰ ساس

**تەختە پێچ / textepêç/:** ☜ **تەتەپێچ**

**تەختــەڕەش / texteřeş/:** نــاو. دەپـــەڕەش؛ ئـــەو تەختەی ڕەش دەکرێ و لـە فێرگـە لـە سـەری دەنووسن ☰ تختەسیاه

**تەختەساف / textesaf/:** ناو. کلافەدەزووی لە سەر پارچە مقەبا هەڵکراو ☰ کلاف نخ بر مقوا

**تەختەسپی / textes(i)pî/:** ☜ **وایتبورد**

**تەختەسەرا / textesera/:** ناو. کەف؛ تەخت؛ تەرک ☰ کف

**تەختەشنۆ / texteş(i)no/:** ناو. تەختەیەکی باریک و درێژ (نزیک ٥ لە ٥٠ سانتیمیتر) بـە ژێرەیـەکی کورتەوە کە وەرزشکار دەسـتی پێـوە دەگـرێ و شنۆی پێ دەکا ☰ تختەشنا

**تەختەقاپـو / texteqapû/:** ناوەڵناو. تەحتـەقاپوو؛ تەختەقاپی؛ ئاوایینشین؛ سەقامگیر ☰ تختەقاپو

**تەختەقاپی / texteqapî/:** ☜ **تەختەقاپو**

**تەختەکالۆس / textekalos/:** نـاو. ڕووناس؛ جـۆرێ مۆریانە ☰ نوعی موریانە

**تەختەنـەرد / textenerd/:** نـاو. تاوڵـە؛ تەختــە ☰ تختەنرد

**تەخچک / texçik/:** ناو. دۆڵ؛ گەلی؛ شیو ☰ درّە

**تەخدەمە / texdeme/:** نـاو. بەرکوت؛ دەغڵـێ کـە بەر لە دروێنە هێندێکی بـۆ ئـەزموون دەدروون و دەکوتن ☰ مقدار کمی از غلە کە برای آزمایش مـی کوبند

**تەخسیر / texsîr/:** نـاو. ١. کۆتـــایی؛ هەڵـــە ٢. لـەشگـرانی ٣. *[کینایە]* ژنـێ کـە مێردەکـەی سەرجێیی ناکا ☰ ١. تقصیر؛ کوتاهی ٢. کسـالت ٣. زن بینصیب از همخوابگی با شوهر

**تەخش / texş/:** ناو. تیر؛ هەواڵـی کـەوان «بواچـان کوشتەی زام تەخش تۆن/ ناواک نیان دیدەی وەحش تۆن «بێسارانی»» ☰ تیر

**تەخشان / texşan/:** لێل. ← **تەخشانوپەخشان**

**تەخشانوپەخشان / texşan û pexşan/:** نـاو. کارێ ڕژاندن و پژاندن ☰ ریختوپاش

◘ **تەخشانوپەخشـان کـردن:** ڕژانـــدن و پژانـــدن؛ بەخشـینی نابـەجێ و بەخەسـار دانی مـاڵ و سـامان ‹بــۆ خــۆ نوانــدن و فیــز کــردن تەخشانوپەخشان دەکا› ☰ ریختوپاش کردن

**تەخشک / texşik/:** ناو. ڕفحە؛ ڕفە ☰ تاقچە

**تەخلیت / texlît/:** ناو. ١. جـۆر؛ تـەرز ٢. بـەدەڵ؛ قەڵب ٣. گەپ؛ گاڵتە ٤. دەمەلاسکێ؛ لاسایی ☰ ١. گونە ٢. بَدَل ٣. شوخی ۴. تقلید

**تەخم[١] / texm/:** ناو. جێ؛ شوێن ☰ مکان

**تەخم[٢]:** پێرۆ. ← **تەخموتەخم**

**تەخمە / texme/:** ☜ **تەغمە**

**تـەخمین / texmîn/:** نـاو. بـەراورد؛ کـار و ڕەوتی لێکدانەوە؛ قەرساندن ☰ براورد؛ تخمین

**تەخنک / texnik/:** ناو. قـاپی گـەورەی لـە مـس؛ سەعەندی گەورە ☰ ظرف بزرگ مسین

**تەخەر / texer/:** ناو. ١. زۆرینـە؛ زۆرتـری؛ بەشـی زۆربە ٢. خێڵ؛ عەشیرە ☰ ١. اکثریت ٢. عشیرە

**تەدار / tedar/:** ناوەڵناو. یاودار ☰ تبدار

**تەر / ter/:** ☜ **تر[١]ـ١**

**تەرا / tera/:** ☜ **تەرە[٢]**

◘ **تەرا بون:** ١. لە بڵـندەوە کـەوتن ٢. لـە مـاڵ دوور کەوتنەوە ٣. وێڵ بـوون؛ تـار بـوون ☰ ١. پایین افتادن ٢. مهجور ماندن ٣. آوارە شدن

**تـەرات / terat/:** نـاو. تـەڕاد: ١. چوارنـاڵ؛ غـاری یەکسم، بەتایبەت ئەسپ ٢. ڕمبازی بـە ئەسـپ؛ هاتوچـۆ بـە ئەسـپ لـە مەیدانـدا ☰ ١. تاخـت؛ چهارنعل ٢. جولان با اسب

◘ **تەرات کردن:** ١. غار دان ٢. ڕمبـازی کـردن ☰ ١. تاختن ٢. جولان دادن با اسب در میدان

**تـەراتێن / teratên/:** نــاو. تـــەڕاتێن؛ ڕمبـــازی؛ هاتوچۆ بە ئەسپ لە مەیداندا ☰ جولان بـا اسـب

در میدان

**تەراخوم / teraxum/:** ☜ **تەراخۆمە**

**تەرار / terar/:** ناو. زەرک؛ تاسوولکەی ئاو خواردنەوە ⇐ تاس آبخوری

**تەراز[1] / teraz/:** ناو. ١. وەک؛ وێنە ٢. ☜ **تراز[1]-١** ⇐ ١. مانند ٢. ☜ **تراز[1]-١**

**تەراز[2]:** ئاوەڵناو. ڕێک؛ بەرانبەر ⇐ یکسان؛ برابر

**تەرازو / terazû/:** ☜ **تەرازو**

**تەرازوباز / terazûbaz/:** ئاوەڵناو. *[پلار]* کەمفرۆش؛ سووکفرۆش ⇐ کم فروش

**تەرازوڕاست / terazûřast/:** ☜ **تەرازومەند**

**تەرازومەند / terazûmend/:** ئاوەڵناو. تەرازووڕاست؛ بێفێڵ لە کێشاندا ⇐ درستکار در وزن کردن

**تەرازی / terazî/:** ☜ **ترازو**

**تەرازیا / terazya/:** ناو. شەونم؛ خوناوە ⇐ ژاله

**تەراش / teraş/:** ناو. کاری سەر و ڕیش چاک کردن ⇐ اصلاح سر و صورت

**تەراشتن / teraştin/:** ☜ **تەراشین**

**تەراشین / teraşîn/:** چاوگ. تەراشتن؛ تراشین؛ تاشین ⇐ تراشیدن

**تەراف / teraf/:** ناو. تەرافە: ١. سمت و کەفەڵی یەکسم ٢. تەڕاد؛ گۆشت و پێستی خالیگە ٣. مێورە؛ ئەو لقانەی مێو کە بۆ هەرەس دەبن ⇐ ١. کفل چهارپا ٢. پوست و گوشت تُهیگاه ٣. شاخەی هرس شدنی تاک

⊡ **تەراف کرن:** بڕینی ڕەز؛ باغ بڕین ⇐ هرس کردن تاک

**تەرافە / terafe/:** ☜ **تەراف**

**تەراکتۆر / teraktor/:** ناو. تراکتۆر: ١. کەرەستەیەکی موتۆری بە دوو تەگەرەی گەورە و ئاژدارەوە بۆ ڕاکێشانی مەکینەی کشتوکاڵ (وەک: گاواسن، تووپاش، خەرمانکوت) ٢. *[مەجاز]* پڕکار؛ خاوەن هێز و پێز لە کاردا ٣. *[مەجاز]* زۆرخۆر ⇐ ١. تراکتور ٢. پُرکار ٣. پُرخور

**تەربیش / terbîş/:** ناو. تەکمیش؛ کار و ڕەوتی بنکۆڵیی ڕەز و بێستان ⇐ پی زدن و سست کردن خاک جالیز

**تەرپلاندن / terp(i)landin/:** چاوگ. ڕەت پێ دان ⇐ سکندری دادن

**تەرپلین / terp(i)lîn/:** چاوگ. ڕەت بردن؛ هەڵەنگووتن ⇐ سکندری خوردن

**تەرت[1] / tert/:** ناو. ١. کەمرە؛ گەمرە؛ گرمە؛ سەنیری وشکهەڵاتوو ٢. بێشە؛ دەوەن ٣. کەستەک؛ کولۆی خاک ٤. کلۆشی گێرەکراوی هێشتا شەن نەکراو ٥. هەڵدێر؛ هەڵەت ⇐ ١. سرگین خشک‌شده ٢. بیشه ٣. کلوخ ۴. خرمن کوبیده شده‌ی هنوز باد داده نشده ۵. پرتگاه

**تەرت[2]:** ئاوەڵناو. ١. بڵاو؛ پەرێشان؛ پەرژ ٢. لە بەینچوو؛ لە ناودا نەماو ⇐ ١. پراکنده ٢. از میان رفته

**تەرتلاندن / tert(i)landin/:** چاوگ. سەر لێ شێواندن ⇐ گیج کردن

**تەرتلین / tert(i)lîn/:** چاوگ. سەر لێ شێوان؛ گێج بوون ⇐ گیج شدن

**تەرتوتونا / tert û tûna/:** ئاوەڵناو. تەفروتوونا؛ هەر نەماو؛ لە بەینچوو؛ فەوتاو بە یەکجاری ‹لە شەڕدا بنەماڵەی تەرتو توونا بوون› ⇐ برباد رفته

**تەرتوتەلان / tert û telan/:** ناو. هەڵدێر؛ هەڵەمووت؛ ڕژد ⇐ پرتگاه

**تەرتول / tertûl/:** ناو. کرمی سەوزی؛ کرمێکە ئافەتی گیاشین ⇐ کرم آفت گیاهان

**تەرجسە / terc(i)se/:** ناو. شین بوونەوەی شوێنی لێدراو ⇐ کبودی اثر ضربه

**تەرجگ / tercig/:** ☜ **تەرچك**

**تەرجگی / terc(i)gî/:** ☜ **تازەیی[1]**

**تەرجمان / terc(i)man/:** ناو. وەرگێڕ؛ پاچڤەکار؛ دیلمانج ☰ مُترجم

**تەرجومان / tercuman/:** ناو. وەرگێڕ؛ پاچڤەکار ☰ مُترجم

**تەرجومە / tercume/:** ناو. تەرجەمە؛ پاچڤە؛ وەرگێڕاوە ☰ ترجمە

**تەرجۆ / terco/:** ناو. پەرجۆ؛ کرمزی؛ مەهدەر؛ کاری کەس نەکردوو ☰ مُعجزە

**تەرجە / terce/:** ناو. دەلاقە؛ دەروەچە ☰ پنجرە

**تەرجەمە / terceme/:** ☜ تەرجومە

**تەرچک / terçik/:** ناوەلناو. تەرجگ: ١. تەڕ و تازە ٢. شلک؛ ناسک؛ تورت ☰ ١. تروتازە ٢. تُرد و نازک

**تەرچکی / terç(i)kî/:** ☜ تازەیی[1]

**تەرح[1] / terĥ/:** ناو. ١. بیچم؛ شکڵ؛ سەروسەکوت ٢. قل؛ لق؛ لاسکی گیا و گوڵ ☰ ١. قیافە ٢. ساقەی گل و گیاە

⊡ **تەرحی کەسێک مردن:** دۆعا بۆ مردنی کەسێک کردن ‹هەرچی مەحبووبان دەکەن خۆشە، بەلام داخی ڕەقیب/ دەمکوژێ، تەرحی مرێ، هەر وەک کەری بێگارییە «موستەفابەگی کوردی»› ☰ سر کسی زیر سنگ رفتن

**تەرح[2]:** ئامراز. وەک؛ لە گوێن ☰ شبیە

**تەرخ / terx/:** ناو. تەرک؛ کاری دەست هەڵگردن؛ واز هێنان ☰ ترک

**تەرخان / terxan/:** ناو. ١. پاوان؛ تایبەتی ٢. ئازاد لە باج و بەهرەی ئاغا ☰ ١. اختصاصی ٢. معاف از مالیات و بهرەی مالکانە

⊡ **تەرخان کردن:** بە تایبەتی بۆ شتێ یان کارێ دانان ‹... تەنانەت گەلێ لە زانایانی کوردیش هەموو ژیانی خۆیان بۆ تەرخان کردووە «زەبیحی»› ☰ اختصاص دادن

**تەرختە / terixte/:** ناو. پشتەمازە؛ مۆغەرە ☰ مازە

**تەرخول / terxul/:** ناو. خولخولە؛ کەرخول ☰ گردنا

**تەرخون / terxun/:** ناو. جۆرێ سەوزی خواردن ☰ ترخون

**تەرداس / terdas/:** ناو. تەورداس ☰ داس شاخەبری

**تەرز[1] / terz/:** ناو. ١. لکی داوەبەنئاسای ڕەز ٢. سەرلکی باریکی برکە بێستان ٣. جۆر؛ چەشن ‹ڕاستی هەزار تەرز نەزاکەت دارۆ/ هەر تەرزێ سەد تەرز کەیف دڵ مارۆ «مەولەوی»› ٤. شێواز؛ شێوە ‹هەر تاوێ بە تەرزێ دڵی داماوم ئەلەرزێ› ☰ ١. شاخەی باریک و نخ مانند تاک ٢. شاخ و برگ گیاهان پالیزی ٣. نوع ۴. شیوە

**تەرز[2]:** ناوەلناو. لەبار؛ پەسند ‹لە ناو چەمەن سەربەرزی/ چەن ناسک و شلک و تەرزی «کەریم شارەزا»› ☰ دلپسند

**تەرز[3]:** ئامراز. وەک؛ وەکوو ☰ مانند

**ـ تەرز[4]:** پاشەوشە. چەشن ‹تەرزەتەرز› ☰ ـ آسا

**تەرزم / terzim/:** ☜ تەرزە

**تەرزۆکە / terzoke/:** ☜ تەرزە

**تەرزە / terze/:** ناو. تەرەز؛ تەزرە؛ تەرزم؛ تەرزۆکە؛ تەوەرگ؛ ترکژۆک؛ ترگژۆک؛ تگر؛ تووەرگە؛ تەرگ؛ تەرگژۆک؛ تەرکژۆک؛ تەگر؛ تەگرک؛ تەوەرگە؛ تەیرۆک؛ گللێرە؛ دەنکی خڕیلانەی یەخ کە لە سارد بوونەوەی کتوپڕی هەوادا دادەبارێ ☰ تگرگ

**تەرزەشکێن / terzeş(i)kên/:** ☜ تەرزەکوت

**تەرزەکوت / terzekut/:** ناو. تەرزەشکێن؛ تایبەتمەندی دار یان زەرعاتی تەرزە لێی داو ☰ حالت درخت یا کشتزار آسیبدیدە از تگرگ

**تەرزەلووکە / terzelûke/:** ناو. گللێرکە؛ تەرزەی ورد ‹گەر بەیازی عارزت دەرخەی لە ژێر چارشێوی ڕەش/ بەفری کوێستانی چ جیلوە؟ تەرزەلووکەی تەڕ چییە؟ «قانع»› ☰ تگرگ ریز

**تەرس / ters/:** ناو. سەنیری یەکسم ☰ پِهِن

**تەرسای** / tersay/: چاوگ. ترسان؛ ترسیان ☰ ترسیدن

**تەرسنای** / tersnay/: چاوگ. ترساندن؛ ترسانن ☰ ترساندن

**تەرسۆنەک** / tersonek/: ☜ **ترسنۆك**

**تەرسە** / terse/: ئاوەڵناو. پێچەوانە؛ بەراوەژی ‹ڕەقیبم تیری تانەی گەر بهاوێژێتە سەر فەردم/ حەواڵەی جووتە جووتە و تەرسەکەی کابرای بەهارم کرد «عارف عورفی»› ☰ وارونه؛ برعکس

**تەرسەزاڵ** / tersezał/: ☜ **ترسنۆك**

**تەرسەقول** / tersequl/: ناو. خەرسەقول؛ قارسەقول؛ سەنیری وشکەوەبووی کەر ☰ سرگین خشک شدەی الاغ

**تەرسی** / tersî/: ☜ **ترس[1]ـ۱**

**تەرش** / terş/: ناو. کەری؛ کەرک؛ کەرتکە ئاژەڵ ☰ بخشی از گله

**تەرشداری** / terşdarî/: ناو. مەڕداری؛ ئاژەڵداری ☰ گلەداری

**تەرشک** / terşik/: ناو. قەڵشت؛ درزی گەورە ☰ شکاف

**تەرفتین** / teriftîn/: ناو. شپرزەیی؛ ئاڵۆزکاوی ☰ ازهم‌پاشیدگی

**تەرفک** / terfik/: ناو. پارچەدەزوو؛ داوەدەزوو ☰ تکەنخ

**تەرفە** / terfe/: ناو. خاپ؛ فریو ☰ فریب

**تەرک** / terk/: ناو. ۱. تەرخ؛ کار و ڕەوتی دەس لێ بەردان؛ بەجێ هێشتن ‹گەر نەکا مەخموور ئەفەندی تەرکی تریاکی لەعین/ فێری سێ نەزمی دەکا: پژمین و کۆکین و ترین «شێخ ڕەزا»› ۲. بەشی دواوەی زین کە هەگبەی لە سەر دادەبەستن ۳. چەکی شەڕ ٤. تەخت؛ ڕووبەری ساف لە سەر زەوی ‹تەرکی ژوورەکەیان فەرشێکی لێ ڕانەخراوە› ☰ ۱. ترک ۲. ترکِ زین ۳. اسلحه ۴. کف

⊡ **تەرک دان**: تەرک کردن؛ نانە لاوە؛ دەست لێ بەردان؛ وێڵ کردن ‹دوو ساڵە جگەرەی تەرک داوە› ☰ ترک کردن

**تەرک کردن**: ۱. ☜ **تەرك دان** ۲. بەجێ هێشتن ‹ماوەیەکە ژن و منداڵ تەرکیان کردووە› ☰ ۱. ☜ **تەرك دان** ۲. تنها گذاشتن

**تەرک کەوتن**: ۱. لە جێ چوونی جوجکە سمت ۲. لە جێ چوونی جومگەی پەلی ماڵاتی بەرز ☰ ۱. از جا در رفتن دنبالچه ۲. از جا در رفتن مچ پای دام

**تەرک** / terik/: ناو. خشڵێکی ژنانە ☰ نوعی زیور زنانه

**تەرکبەند** / terkbend/: ناو. بەن‌سامۆرتە ☰ فتراک

**تەرکزە** / terk(i)ze/: ئاوەڵناو. تۆکز؛ بقە ☰ خطر

**تەرکژۆک** / terk(i)jok/: ☜ **تەرزە**

**تەرککراو** / terkk(i)raw/: ئاوەڵناو. ڤەهێلای؛ بەجێ هێلراو ☰ متروک

**تەرکمەنە** / terk(i)mene/: ئاوەڵناو. ئامادە؛ گورج ☰ آمادە؛ پابەیراق

**تەرکە** / terke/: ناو. ۱. شووڵ؛ تووڵ؛ شوولک ۲. تەرەکە؛ جۆرێ قامیشی ناوپڕ ☰ ۱. ترکه ۲. نوعی نی توپر

**تەرکەدنیا** / terkedinya/: ناو. *[مەجاز]* هەبیس؛ پارسا؛ مرۆی چاکی دوورەدنیا ☰ زاهد

**تەرکەدیار** / terked(i)yar/: ☜ **تەرکەزا**

**تەرکەز** / terkez/: ناو. دار تەقڵە لە ساقەتی خەیزەران ☰ چوب چوگان از جنس خیزران

**تەرکەزا** / terkeza/: ئاوەڵناو. تەرکەزێو؛ تەرکەدیار؛ تەرکەوەتەن ☰ ترک وطن‌کرده

**تەرکەزێو** / tarkezêw/: ☜ **تەرکەزا**

**تەرکەندە** / terkende/: ناو. سەرەتا؛ هەوەڵ ‹لە تەرکەندەوە وا هاتووە› ☰ ابتدا

**تەرکی**[1] / terkî/: ناو. لای کەفەڵ لە زینـدا؛ جـێ خورج و هەگبەی سوار 🇮🇷 ترک زین

**تەرکی**[2]: ئاوەڵناو. تەژە؛ زلحۆل 🇮🇷 لندهور

**تـەرکی ژێـر بـەرە** / terkî jêr beře/: نـاو. هاوسـاوەزەنگێ؛ گەمەیـەکی لاوانی گوندنشـینە، دوو کەس دەچنە ژێـر بەرەیەکـەوە کـە یـەکیان پێشـتر ئـەو گەمـەی نـەدیووە، ئـەوەی دەزانـێ، شووڵکێکی بە دەستەوە، یەکیان لە هاوگەمەکەی دەدا و یەکێ لە عەرزەکە، هاوگەمەکەی پێی وایە لە هـەردووکیان دەدەن، دەبـێ بلـێن کـێ بـوو لێیانی دا 🇮🇷 از بازی‌های جوانان روستایی

**تەرگ** / terg/: ☜ **تەرزە**

**تەرگژۆک** / terg(i)jok/: ☜ **تەرزە**

**تەرگە** / terge/: ناو. چارەکەی کـۆڵ؛ کۆڵـوانە 🇮🇷 شنل

**تەرم** / term/: ناو. ۱. جەنازە؛ لاشە؛ جەنـدەک ۲. بنکۆڵی ڕەز؛ تەکمیش ۳. ☜ **تەرمێ نـویحی** 🇮🇷 ۱. جنازه ۲. عمل پی زدن و سُست کردن خاک رَز ۳. ☜ **تەرمێ نویحی**

**تەرمەک** / termek/: ناو. تەرمەگ؛ تایـەی درێـژ و باریکی گڕاڵک و دڕک و داڵ 🇮🇷 کُپه‌ی خار

**تەرمەگ** / termeg/: ☜ **تەرمەك**

**تـەرمێنویحی** / termên(i)wîĥî/: نـاو. تـەرم؛ حەوبراله؛ حەوتەوانە؛ حەوت ئەستێرە لە ئاسمـان 🇮🇷 هفت برادران

**تەرن** / tern/: ناو. بەڵا؛ چۆرتم 🇮🇷 بلا

**تەرنـە** / terne/: نـاو. چـاوەنۆڕی؛ چـاوەڕوانی؛ چەمەڕایی؛ چاڤنێری 🇮🇷 انتظار

**تەرنەبابیلە** / ternebabîle/: ☜ **تەیر_۲**

**تەرواڵ** / terwał/: ناو. تەرواڵە: ۱. هەرزاڵ؛ پێرک؛ سەکۆی دارینی بەری ڕەشماڵ ۲. ڕفحە؛ ڕفـە 🇮🇷 ۱. سکوی سیاه چادر ۲. رف

**تەرواڵە** / terwałe/: ☜ **تەرواڵ**

**تەروەنـدە** / terwende/: ئاوەڵـناو. ۱. کـەموێنـە؛ هەڵکەوتە ۲. تازەبەر؛ نۆبەرە؛ نۆبەری گوڵ و میوە 🇮🇷 ۱. کم‌نظیر ۲. نوبر

**تەروەنە** / terwene/: ئاوەڵـناو. پـەخش؛ پەرشـە؛ پرش و بلاو 🇮🇷 پراکنده

**تەرۆزی** / terozî/: ☜ **ترۆزی**

**تەروو** / terû/: ناو. تێروو؛ تـێروێ؛ تریـو؛ تـەرەون؛ تەرەوەن؛ تەرینە؛ دارێکی دەوەنە بنی بۆ بالووکـە بەکەڵکە 🇮🇷 درختچه‌ای است جنگلی

**تەرە**[1] / tere/: ناو. ئەو قووڵکە تووتن یـان میـوەی تێ دەکەن و بە گیـا دایدەپۆشـن 🇮🇷 گـودالی کـە میـوه یـا بـرگ توتـون در آن مـی‌ریزنـد و بـا بـرگ می‌پوشانند

**تەرە**[2]: ئاوەڵناو. تەرا: ۱. لە لانە تۆراو بە یـەکجاری ۲. *[مەجاز]* ئاوارە؛ تراڤیە ‹... پڕی سەوزەبەستەی خرۆشانی باڕی/ تەرەی باوەشی تاسەباری بناری ... «سوارە»›. هەروەها: **تەرە بوون؛ تەرە کردن** 🇮🇷 ۱. رمیده (از کاشانه) ۲. آواره

**تەرەجە** / terece/: ئاوەڵـناو. تاک؛ بە تەنیا 🇮🇷 یکـه؛ تنها

**تـەرەدوا** / tered(i)wa/: نـاو. ۱. دۆخـی تـۆرانی یەکجارەکی ۲. کاری دەرکردنی یـەکجارەکی 🇮🇷 ۱. قهر دائمی ۲. اخراج قطعی

**تەرەدین** / teredîn/: ئاوەڵـناو. شێتۆکە؛ کەللەیی 🇮🇷 خُل و چِل

**تەرەز** / terez/: ☜ **تەرزە**

**تەرەزوو** / terezû/: ناو. قەرقاوڵ؛ چۆڕ؛ کەڵەشێری کێوی 🇮🇷 قرقاول

**تەرەزەن** / terezen/: ناو. شەلیل؛ شلۆر 🇮🇷 شلیل

**تەرەس** / teres/: ئاوەڵناو. بێئاکار؛ خوێڕی 🇮🇷 پست؛ رذل

**تەرەف** / teref/: ناو. لا؛ ئالی ‹ئـەو بـۆ جـەو تـەرەف سوب نەسیم ماوەرد/ هـەر جـە دوورەوە زام سـارێش

مەکەرد «مەولەوی»› 🇮🇷 سو؛ طرف

**تەرەفاندن** / terefandin/: چاوگ. قەدکردن؛ برین 🇮🇷 بریدن

**تەرەفدار** / terefdar/: ناوەلناو. لایەنگر؛ لاگر؛ داژدار 🇮🇷 هواخواه؛ طرفدار

**تەرەفە** / terefe/: ناوەلناو. سکلەوەڕێن؛ پلەندەر 🇮🇷 طفیلی

**تەرەقاندن** / tereqandin/: چاوگ. پەقاندن؛ تەقاندن 🇮🇷 ترکاندن

**تەرەقە** / tereqe/: ناو. ۱. چەشنی؛ چاشنی؛ گوللەپێکەر ۲. کەرەستەیەکی منالان کە لە جێژناندا دەیتەقێننەوە 🇮🇷 ۱و۲. ترقه

**تەرەقی** / tereqî/: ناو. کار و ڕەوتی چوونە سەرەوە؛ بەرزتر بوونەوە 🇮🇷 ترقی

**تەرەکراو** / terek(i)raw/: ناوەلناو. تاراو؛ دەرکراو 🇮🇷 رمیده

**تەرەکە** / tereke/: ناو. تەرکە؛ جۆرێ قامیشی باریکی ناوپڕ 🇮🇷 نوعی نی باریک و توپر

**تەرەکەمە** / terekeme/: ناوەلناو. ئاوارە؛ وەیلان؛ بێخانەولانە 🇮🇷 آواره

**تەرەکیوەن** / terekîwen/: ناو. بەنتەرکی؛ بەنێ کە بە تەرکی زینەوەیە و شتی پێ دەبەستنەوە 🇮🇷 بند فتراک

**تەرەوڵ** / terewił/: ناو. پەلەوەر؛ باڵندە 🇮🇷 پرنده

**تەرەوِن** / terewin/: ☜ **تەرەو**

**تەرەوەژە** / tereweje/: ناو. باڵندەیەکە 🇮🇷 پرندەایست

**تەرەوەن** / terewen/: ☜ **تەرەو**

**تەری** / terî/: ناو. ۱. کلێنچە؛ جوچکە سمت؛ ئێسکی قوونێ ۲. دووگ 🇮🇷 ۱. دُنبالچه ۲. دُنبه

**تەریان** / teryan/: ناو. تریان؛ تریانە 🇮🇷 سبد کوچک میوەچینی

**تەریانە** / teryane/: ناو. ساقۆڕ؛ سەوەتە 🇮🇷 سبد بزرگ

**تەریب**[1] / terîb/: ناو. ۱. کاری دروون بە تەقەڵی درشتی قیچەڵفاچ ۲. بەلاڤ؛ تەرس؛ تەپالە 🇮🇷 ۱. دوخت با بخیەهای درشتِ مورب ۲. تاپاله

⊡ **تەریب دان**: دوورین بە تەقەڵی قیچەڵفاچ بۆ قایمتر بوون 🇮🇷 دوختن با بخیەی مورب برای استحکام بیشتر

**تەریب**[2]: ناوەلناو. ۱. تایبەتمەندی دوو هێڵ لە ڕاستی یەکدا کە هەرگیز بە یەک نەگەن ۲. هاوشان؛ هاوتا 🇮🇷 ۱. موازی ۲. همسان

**تەریبوجۆدان** / terîb û codan/: ناو. جۆرێ تەقەڵی درشت لە کلاوی دەدەن و ئەوجار بەن دەکەنە بەینی تەقەڵەکاندا بۆ ئەوەی کلاوەکە ڕەق ڕاوەستێ 🇮🇷 نوعی بخیەی کلاه

**تەریدە** / terîde/: ناو. چەتە؛ ڕێگر؛ گۆران 🇮🇷 راهزن

**تەریرە** / terîre/: ☜ **تەریە**

**تەریفە** / terîfe/: ناو. تریفە؛ نەخۆشینی ئاژەڵ کە نابێ گۆشتەکەی بخورێت 🇮🇷 از بیماری‌های دام

**تەریق** / terîq/: ☜ **تەریق**

**تەریقکەر** / terîqker/: ☜ **تەریقکەرەوە**

**تەریقکەرەوە** / terîqkerewe/: ناوەلناو. ڕووشکێن؛ تەریقکەر 🇮🇷 از رو بَر

**تەریقەوەبوو** / terîqewebû/: ناوەلناو. چاوبەرەژێر؛ چاوشۆڕ؛ ڕووگیر 🇮🇷 شرمسار

**تەریقی** / terîqî/: ناو. خەجاڵەتباری؛ شەرمەزاری 🇮🇷 شرمندگی

**تەریک** / terîk/: ناوەلناو. تەریو: ۱. دوورەپەرێز؛ بەپارێز ‹بتەوێ لەگەڵ خوادا خەریک بی/ ئەبێ لە پیاوی بەدکار تەریک بی «پیرەمێرد»› ۲. جیا؛ جیاواز ‹لایان وایە ئەم دنیایە گشتی هەر ئەوەی تێدایە کە ئەوان پێوەی خەریکن. واتا لە ئاوەز و فکرا هەموو پێکەوە شەریکن. لە دنیای بەدەر لە خۆیان، لە

بیر و بڕوای نامۆیان، دوور و بێ ئاگا و تەریکن «هەژار، *چوار نامیلکه*»). هەروەها: **تەریک بوون؛ تەریکەوە بوون** ☰ ۱. پرهیزدار ۲. جُدا

**تەریکی** / terîkî/: ناو. گۆشەگیری ☰ عُزلت

**تەرینە** / terîne/: ☜ **تەرو**

**تەریو** / terîw/: ☜ **تەریك**

**تەریە** / terye/: ناو. تەریرە؛ چەتە؛ ڕێگر ☰ راهزن

**تەریەگەری** / teryegerî/: ناو. تیرۆر؛ ڕەشکوژی؛ ڕەشەکوژی؛ کاری پەنامەکی و بە دزییەوە بۆ کوشتنی کەس یان کەسانێک ☰ ترور

**تەرییە** / terîye/: ناو. چەتە؛ ڕێگر ☰ راهزن

**تەرێف** / terêf/: ناوەڵناو. پیس؛ گڵاو؛ گەمار؛ کۆتی ☰ پلید؛ نجس

**تەرێق** / terêq/: ناوەڵناو. ترێق؛ تەریق ↓

⊡ **تەرێق بوونەوە** تەرێقەو بوون؛ شەرمەزار بوون ☰ شرمنده شدن

**تەرێق کردنەوە** شەرمەزار کردن؛ تەرێقەو کردن؛ چەرمگ کردنەوە ‹جە عەرسەی مەحشەر مەکەر تەرێقم/ بە لوتف مەحزت بدەر تەوفێقم «میرزا شەفیع پاوەیی»› ☰ شرمنده کردن

**تەرێقەوبوو** / terêqewbû/: ناوەڵناو. ڕووگیر؛ شەرمەزار؛ تەرێقەوەبوو ☰ خجالتزده

**تەرێقەوەبوو** / terêqewebû/: ☜ **تەرێقەوبوو**

**تەرێقی** / terêqî/: ناو. تەریقی؛ شەرمەزاری؛ خەجاڵەتباری ☰ خجالت

**تەڕ**[1] / teř/: ناوەڵناو. ۱. نمدار؛ گەوزاو لە تراودا ‹جلەکانم تەڕە› ۲. شل؛ ئاودار؛ بە ئاو ‹چێشتی تەڕ›. بەرانبەر: **خەست** ۳. *[مەجاز]* چاک؛ پڕبەپێست ‹شەقی تەڕ› ٤. *[مەجاز]* خراپ؛ ناخۆش ‹تەڕە، هەسە، هەر ئەمەسە «مەسەل»› ٥. تەڕ و تازە؛ تەرچک ‹خەنجەری دەبان، تەواو کالان زەڕ/ سەرتاپا بالای، وەک ڕێحانەی تەڕ «قانع»› ☰ ۱. خیس؛ تر ۲. شُل؛ آبکی ۳. درُست و حسابی ۴. بد؛ ناخوشایند ۵. شاداب

⊡ **تەڕ بون** ۱. شل بوون ۲. ئاودار بوون؛ بەئاو بوون ۳. *[کینایە]* شەرم و حەیا کردن ‹هێندە بێباره به هیچ شتێ تەڕ نابێ› ☰ ۱. خیس شدن ۲. شُل و آبکی بودن ۳. درس عبرت گرفتن

**تەڕ بوونەوە** ۱. ڕزگار بوونی ماڵات لە کا خواردن و دەس بە گیا خواردن کردنەوە ۲. *[مەجاز]* ژن هێنان یان شوو کردن بە پیری ۳. ئاودار بوونەوە ٤. دیسانەوە تەڕ بوون ☰ ۱. دوباره گیاه و سبزەی تازە چریدن ۲. سر پیری همسر اختیار کردن ۳. شُل و آبکی شدن ۴. دوباره خیس شدن

**تەڕ کردنەوە** ۱. لەوەڕی سەوز دان بە ماڵات دوای زستان ۲. بە ئاو یان تراوی تر شل کردنەوە ☰ ۱. چراندن دام بعد از مدتها علف خشک دادن ۲. رقیق کردن

**لە تەڕ خواردن و لە وشک خەوتن**/*[پەلار]* لە خۆشی تەواودا بوون و تووشی هیچ کێشەیەک نەهاتن ‹هێزە سیاسییەکان خەمی کێشە و بارودۆخەکەیان نییە، ئەوان لە تەڕ دەخۆن و لە وشک دەخەون› ☰ خوش گذراندن و غصەی چیزی را نخوردن

**تەڕ**[2]: ناوەڵکار. زۆر باش ‹تەڕم زانی؛ تەڕت نەزانی› ☰ خوب

**تەڕ**[3]: پێشوشە. چاک؛ جوان ‹تەڕزمان؛ تەڕپۆش› ☰ خوش ـ

ـ **تەڕ**[4]: پاشەوشە. *[مەجاز]* ۱. زیندوو؛ خاوەن جۆش و خرۆش ‹دڵتەڕ› ۲. پیس ‹داوێنتەڕ› ☰ ۱. زنده ۲. آلوده

**تەڕئاوس** / teř'awis/: ☜ **تەڕاوس**

**تەڕات** / teřat/: ناو. چوارناڵ؛ غار؛ چوارناڵە ☰ چهارنعل

**تەڕاتێن / teřatên/**: ناو. جریدانێ؛ غارغارێن تاخت‌وتاز

**تەڕاخۆمە / teřaxome/**: ناو. تەراخوم؛ ئالەک؛ نەخۆشییەکی چڵکی چاوە، دەبێتە هۆی ترسان لە ڕووناکی، ئێش و فرمێسکڕێژی و بڕێ جاریش کوێری تراخُم

**تەڕاد / teřad/**: ناو. تەڕاڵ: ١. پێستی خالیگە؛ پێستی سەر کەلەکە ٢. گۆشتی چەقاڵتە ٣. ☜ تەرات ١. پوست تهیگاه ٢. غُدّەی گوشتی ٣. ☜ تەرات

**تەڕازن / teřazin/**: ناو. تەڕازەن؛ تەڕەزن؛ مێرگی زۆر ئاودار چمنزار پُر آب

**تەڕازەن / teřazen/**: ☜ تەڕازن

**تەڕاش / teřaş/**: ☜ تۆڵاش

**تەڕاف / teřaf/**: ناو. بانەگا؛ بەرگەدە؛ زارگا شرمگاه؛ زهار

**تەڕاڤ / teřav/**: ناو. دزە؛ نمتک؛ دەڵە نشت

**تەڕاڵ[1] / teřał/**: ☜ تەڕاد

**تەڕاڵ[2]**: ئاوەڵناو. تەپ؛ تەوەزەل؛ سست و بێکارە لش

**تەڕانە / teřane/**: ناو. ترانە؛ کایە؛ گەو بازی

**تەڕاو[1] / teřaw/**: ناو. ١. سواغی ماڵ بە گڵەسپی ٢. *[پلار]* تەڕەچێشت، بەتایبەت ئەوەی کەممایە بێ ‹هیچمان نییە، مەگەر تەڕاوێ لێنێین› ١. نوعی سفیدکاری ٢. آش گِل گیوه

**تەڕاو[2]**: ئاوەڵناو. نەماو؛ فەوتاو نابود

**تەڕاوبەڕا[1] / teřawbeřa/**: ناو. هەڵلاداد؛ تێک‌وپێک هرج و مرج

**تەڕاوبەڕا[2]**: ئاوەڵناو. پرژ و بلاو پراکنده

**تەڕاوس / teřawis/**: ئاوەڵناو. تەڕئاوس؛ هەمیشە شێدار (زەوی) نمدار؛ مرطوب

**تەڕایی / teřayî/**: ناو. تەڕی؛ بەئاوی تری؛ نمناکی

**تەڕبەل / teřbel/**: ئاوەڵناو. تەڕپۆش (تایبەتمەندی پیرێژن) شیکپوش (ویژگی پیرزن)

**تەڕبی / teřbî/**: ناو. داری بەلاڵووکە کێویلە درخت آلبالوی کوهی

**تەڕپل / teřpil/**: ناو. ڕەت؛ دۆخی هەڵەنگووتن؛ ساتمە بردن سکندری

**تەڕپلین / teřp(i)lîn/**: چاوگ. ڕەت بردن؛ هەڵەنگووتن؛ ساتمە بردن سکندری خوردن

**تەڕپۆش / teřpoş/**: ئاوەڵناو. خۆشپۆش؛ بۆشناغ؛ تەڕەنداز شیکپوش

**تەڕپۆشی / teřpoşî/**: ناو. کۆکی؛ پۆشتەیی خوش‌پوشی

**تەڕپیر / teřpîr/**: ناو. پیری دڵ زیندووی بە هەوەس ‹یەک بێوەژنێ تەڕپیری تەڕپۆش/ تۆزێ چەرمەڵە و تەواوی دڵخۆش «قانع»› پیر سرزنده

**تەڕپێچ / teřpêç/**: ناو. کاری بە تەڕی پێچانەوە عمل بستن و پیچیدن در حالت خیسی

▣ **تەڕپێچ کردن:** بە تەڕی پێچانەوە ‹ئەمشۆن بە ئاوی سارد و سابوونی/ تەڕپێچم ئەکەن بێ‌چەندوچوونی «بێکەس»› بستن و پیچیدن در حالت خیسی

**تەڕتووشی / teřtûşî/**: ☜ تەڕوتووشی

**تەڕتەمیس / teřtemîs/**: ئاوەڵناو. ترتەمیس؛ تەڕ و تەمیس؛ پاک و خاوێن تمیز

**تەڕدەس[1] / teřdes/**: ئاوەڵناو. تەڕدەست: ١. مەزبووت؛ چالاک ٢. وەستا و چازان ١. چابک ٢. ماهر؛ زبردست

**تەڕدەس[2]**: ئاوەڵکار. تەڕدەست؛ زوو؛ لەز زود؛ سریع

**تەڕدەست / teřdest/**: ☜ تەڕدەس

**تەڕدەستی / teřdestî/**: ناو. تەڕدەسی: ١. چالاکی؛ چاپکی ٢. لێزانی و دەسڕەنگینی ١. چالاکی ٢. مهارت

**تەڕدەم / teřdem/:** ☜ **تەڕزمان**

**تـەڕدەماخ / teřdemax/:** ئاوەڵـناو. بـــەدەماخ؛ کەیفخۆش ▤ خوشحال

**تـەڕدەماخی / teřdemaxî/:** نـاو. کەیفخۆشـی ▤ خوشحالی

**تەڕزمان / teřz(i)man/:** ئاوەڵناو. تەڕزوان؛ تەڕدەم: ١. قسەزان و بـە گفـتولفـت ٢. زوانچـەور؛ زمانلووس ▤ ١. سخندان ٢. چرب‌زبان

**تەڕزوان / teřz(i)wan/:** ☜ **تەڕزمان**

**تـەڕزوانی / teřz(i)wanî/:** نـاو. *[کینایـە]* لۆسـی ▤ چرب‌زبانی

**تەڕساڵ / teřłsał/:** ☜ **تەڕەساڵ**

**تەڕفام / teřfam/:** ئاوەڵناو. بە زەوق؛ خۆش‌سەلیقە ▤ خوش‌ذوق

**تـەڕک / teřk/:** نـاو. ١. داردەسـتی ئەسـتوور ٢. ئێزنگی ئەستوور و تەڕ ٣. *[مەجاز]* ئەندامی نێرینـە ▤ ١. چُماق ٢. هیزم تر و کلفت ٣. آلت تناسلی مرد

**تەڕکاڵ / teřkał/:** نـاو. مـەزرای دەغڵـی ئـاوی ▤ مزرعەی آبی

**تەڕگەز / teřgez/:** ☜ **خەیزەران**

**تەڕلان / teřlan/:** ناو. ١. تەللان؛ بازی قزڵ؛ شاباز؛ شاتەواو؛ باڵندەیەکی ڕاوکەرە لە تـیرەی بـاز، بـە چاوی زەرد و چرنۆک و دندووکی بە هێزەوە کـە نـزم دەفـڕێ و مێوینـەی گـەورەترە ٢. *[مـەجاز]* جوانچاکی دڵڕفێن ▤ ١. طرلان ٢. زیبای دلربا

**تەڕلـە / teřle/:** نـاو. گیایـەکی هـەرد و دەشـتـە ئەخورێت ▤ گیاهی خوردنی

**تەڕماڵ / teřmał/:** ناو. سمتی چـارەوی؛ کەفەڵـی یەکسم ▤ کفل چارپا

**تەڕن / teřin/:** ئاوەڵناو. ١. فێڵباز؛ گەڕساز؛ دەسـبڕ ٢. بێ‌فەڕ و بەئازار ▤ ١. ناروزن ٢. مردم‌آزار

**تەڕنەبابیلە / teřnebabîle/:** ☜ **تەیر-٢**

**تەڕوبڕ / teř û biř/:** ئاوەڵـناو. ١. ئـاونیش؛ تـەڕ و تلیس؛ زۆر تەڕ ٢. شاد و پاراو ▤ ١. تر و تلیس ٢. شاداب

**تەڕوبەڕی / teř û beřî/:** نـاو. سـەفا؛ تـەرچکی ▤ صفا

**تەڕوتازە / teř û taze/:** ئاوەڵـناو. شـەق و تێـراو؛ لەشۆق و تورت ▤ تروتازه

**تەڕوتلیس / teř û t(i)lîs/:** ئاوەڵناو. کەوتا؛ کەوتە ▤ خیس

**تەڕوتووش / teř û tûş/:** ئاوەڵناو. پڕ لە هەور و باران ▤ بارانی (هوا)

**تەڕوتووشی / teř û tûşî/:** ناو. تەڕتووشی؛ دەمی پڕ لە هەور و باران ▤ موسم بارندگی بسیار

**تەڕ و وشک / teř û wişk/:** نـاو. *[مـەجاز]* خـاس و خراپ ‹تەڕ و وشک پێکەوە دەسووتێن «مەسـەل»› ▤ خوب و بد

⊡ **تەڕ و وشک کردن:** لا گرتن و پەرستاری کـردن؛ بـە دەم کاروبـاری ژیـانی کەسـێکەوە بـوون ‹دایکیان لە پێ کەوت و کچەکانی بە نـۆرە تـەڕ و وشکیان کرد› ▤ تر و خشک کردن

**تەڕوەنـدە / teřwende/:** نـاو. نۆبـەرە؛ تـازە فێراگەیشتی ▤ نوبر

**تەڕووک / teřûk/:** ناو. داری تـەڕەژیبا بـە بـەرێکی سوورەوە کە بۆ نەخۆشی سی و دڵ بەکەڵـکە ▤ درخت طویلک

**تەڕە[1] / teře/:** نـاو. ١. میوەی بێسـتان ٢. کـەوەر؛ کەوەرگ ▤ ١. میوەی جالیزی ٢. تَره

**تەڕە[2]-:** پێشوشە. ١. شتی تەڕ و ئاودار ‹تەڕەچێشت› ٢. سەوز ‹تەڕەپیاز› ▤ ١. تر و تازه ٢. سبز (گیاه)

**تـەڕەبار / teřebar/:** نـاو. ١. نـاوی گشـتی بـۆ بەرهەمی بێستان ٢. *[پلار]* خێڵی ژنان ▤ ١. تره‌بار ٢. جماعت زنان

**تەڕەبازاڕ / teřebazař/:** ناو. بازاری سەوزە و میـوە ▤ میدان تره‌بار

**تەڕەبن / teřebin**/: ناو. تەڕەبنە؛ تەڕەون؛ ناوی بنچکێکی کوڵەبنە، چاڵووکی هەیە و وەک زی وایە 🇮🇷 نام بوتەای خاردار

**تەڕەبنە / teřeb(i)ne**/: ☜ **تەڕەبن**

**تەڕەبەهار / teřebehar**/: ناو. بەهاری زۆر پڕباران 🇮🇷 بهار پُربارش

**تەڕەبیرۆ / teřebîro**/: ناو. سەودایی؛ نەخۆشییەکی پێستە 🇮🇷 اگزمای پوستی

**تەڕەپەنە / teřepene**/: ناو. گیایەکە 🇮🇷 گیاهی است

**تەڕەپیاز / teřep(i)yaz**/: ناو. پیازی شین؛ گەڵا پیازی ناسک 🇮🇷 پیازچە

**تەڕەتوو / teřetû**/: ناو. تووی سپی تازە گەیشتوو 🇮🇷 توت تازە

**تەڕەتوورە / teřetûre**/: ناو. ١. ☜ **تەڕەتیزە** ٢. ☜ **تۆڵەکە-١**

**تەڕەتوورکاو / teřetûřkaw**/: ☜ **تەڕەتوورکە**

**تەڕەتوورکە / teřetûřke**/: ناو. *[پلار]* تەڕەتوورکاو؛ چێشت یان خواردنەوەی بێمایە و بێتام 🇮🇷 آب زیپو

**تەڕەتوورە / teřetûře**/: ☜ **تۆڵەکە -١**

**تەڕەتوڵە / teřetûłe**/: ☜ **تەڕەتیزە**

**تەڕەتیزە / teřetîze**/: ناو. تووزک؛ تووزەک؛ تەڕەتووڵە؛ تەڕەتوورە؛ دێژنک؛ ڕەشادۆک؛ گیایەکی یەکساڵەیە گەڵاکەی دەخورێ و تامی تیژە، گوڵی سپی و سوورکاڵ و بۆنخۆشی هەیە 🇮🇷 شاهی؛ ترتیزک

**تەڕەچێشت / teřeçêşt**/: ☜ **چێشتاو-٢**

**تەڕەزا / teřeza**/: ناوەڵناو. تازەزاو 🇮🇷 تازە زاییدە

**تەڕەزن / teřezin**/: ☜ **تەڕازن**

**تەڕەزەن**[1] **/ teřezen**/: ناو. گیایەکی کوێستانییە، گەڵاکەی وەک پیازە، ماڵات زۆر چاک دەیخۆن، هەتا زستان سەوزە و زەرد نابێ 🇮🇷 گیاهی کوهستانی

**تەڕەزەن**[2]: ناوەڵناو. ١. تازە زاوی زۆر شیردەر ٢. تایبەتمەندی گیاندارێک کە هێشتا وشکی نەکردووە، دیسان بە سەردا زاوەتەوە 🇮🇷 ١. تازە زاییدەی بسیار شیردە ٢. هنوز شیردە دوبارە زاییدە

**تەڕەژیە / teřej(i)ye**/: ناو. گیای تەڕوو 🇮🇷 سنجد صحرایی

**تەڕەساز / teřesaz**/: ناو. ١. شەلەمینی تەڕ؛ ترخێنە بە تەڕی ٢. *[پلار]* ئەوەی بە سووکی لێی بڕوانن 🇮🇷 ١. آش شلغم و گندم ٢. بیمقدار

**تەڕەساڵ / teřesał**/: ناو. بارانەساڵ؛ تەڕساڵ؛ ساڵی زۆر بە باران 🇮🇷 آبسال

**تەڕەسلێمانە / teřes(i)łêmane**/: ناو. گیایەکە 🇮🇷 گیاهی است

**تەڕەشۆ / teřeşo**/: ناوەڵناو. شێدار؛ شەدار 🇮🇷 مرطوب

**تەڕەکاری / teřekarî**/: ناو. تەڕەکاڵی؛ میوەی بێستان و سەوزیجاتی هاوینە 🇮🇷 محصولات جالیزی

**تەڕەکاڵ / teřekał**/: ناو. ١. کار و ڕەوتی شێو کردنی زەوینی باران لێباریو ٢. سەرجەمی ئەو بەرهەمانەی کە پێش کێڵران پێویستیان بە شێو کردن و بەرهەڤکاری هەیە (وەک تەماتە، خەیار، پەتاتە، لوبیا و ...) 🇮🇷 ١. عمل شخم زدن زمین باران خوردە ٢. محصولات جالیزی

**تەڕەکاڵی / teřekałî**/: ☜ **تەڕەکاری**

**تەڕەکەباب / teřekebab**/: ناو. شۆرباوی گۆشتی مریشک بە ترشی سماقەوە 🇮🇷 آبگوشت مرغ با سُماق

**تەڕەکی / teřekî**/: ناو. سکچوونی ماڵات لە بەر خواردنی گیای شینی بەهاری 🇮🇷 اسهال حیوانات

**تەڕەلەیلان / teřeleylan**/: ناو. نێرتکە پیواز 🇮🇷 پیازچە

**تەڕەماست / teřemast/**: ناو. ماستێ کە بۆ زستان ڕادەگیرێ، پیوی بە سەردا دەکەن ☰ ماستی کە برای زمستان نگهداری کنند

**تەڕەماش / teřemaş/**: ناو. ١. ماشی سەوز؛ ماش دە کەلوودا ٢. /پلار/ کەس یان شتی بێنرخ ☰ ١. ماش سبز ٢. فرد یا چیز بی‌ارزش

**تەڕەماش و تەڕەساز / teřemaş û teřesaz/**: ناو. /پلار/ کەسانی بێفەڕ و بێنرخ ☰ افراد بی‌مایە و بی‌ارزش

**تەڕەماڵە / teřemałe/**: ناو. ١. کاری ماڵە کێشانی سواغ ٢. دروێنەی بە لابڕ و بێسواڵە ٣. جۆماڵ؛ کاری خاوێن کردنەوەی جۆگە و ئاوەڕۆ ☰ ١. عمل اندودن ٢. نوعی درو ٣. عمل پاک کردن جوی

**تەڕەنداز / teřendaz/**: ناوەڵناو. تەڕپۆش ☰ شیک‌پوش

**تەڕەوار / teřewar/**: ناو. ١. میوەی تازە ٢. باقە یا مەڵۆ گیایێ کە دەیهێننەوە بۆ ماڵ ☰ ١. میوەی تازە ٢. علوفەی تر و تازە

**تەڕەوِن / teřewin/**: ☜ تەڕەبن

**تەڕەوەز / teřewez/**: ناو. کاری تۆ چاندنی پاش باران ☰ بذرافشانی پس از باران

**تەڕەهەڵوا / teřehełwa/**: ناو. سەیلێ؛ هەڵوای شلی ئاردو ڕۆن و گوڵاو و شەربەتی زۆر کە خەست نابێ ☰ نوعی حلوای شُل

**تەڕی / teřî/**: ناو. ئاوداری؛ بەرانبەری وشکی ☰ تری

**تەڕیزە / teřîze/**: ناو. خالیگە؛ کەلەکە ☰ تُهیگاه

**تەز[1] / tez/**: ناو. ١. کەرخی؛ قەڕسی؛ چۆنیەتی بێهەست و سڕ بوونی ئەندام؛ لە گۆ چوون ‹زڤستان بەز و ئەز، بەهارا پەز و ئەز، هاوینێ تەز و ئەز، پایزا ڕەز و ئەز «فولکلۆر»› ٢. ساردی و فێنکی ☰ ١. کرختی ٢. سردی و خُنکی

▣ **تەز کردن**: تەزین؛ کەرخین؛ سڕ بوون ☰ کرخت شدن

**تەز[2]**: ناوەڵناو. سارد؛ سەرد ‹پاییزە، دار و دەوەن ڕەنگزەردە/ با تەز و سەردە، بە تۆز و گەردە «هەژار، *بۆکوردستان*»› ☰ سرد

**تەزان / tezan/**: ☜ تەزین

**تەزاندن / tezandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //تەزاندت؛ دەتەزێنی/ بتەزێنە// تەزانن؛ تەزنای؛ تۆسنای؛ کەرخاندن؛ قەڕساندن؛ مرۆچە پێ کردن؛ سڕ کردن؛ لە گۆ بردن ☰ کرخت کردن؛ بی‌حس کردن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەتەزاندن

**تەزانن / tezanin/**: ☜ تەزاندن

**تەزبی / tezbî/**: ☜ تەزبێح

**تەزبێح / tezbêĥ/**: ناو. تزبی؛ تەزبی؛ تەسبێح؛ لیزگەی دەستی پیاوان ☰ تسبیح

**تەزرۆکە / tezroke/**: ناو. گژلوک؛ تەزرەی ورد ☰ تگرگ ریز

**تەزرە / tezre/**: ☜ تەڕزە

**تەزک / tezik/**: ناوەڵناو. سڕکەر؛ لەگۆبەر ☰ بی‌حس کننده

**تەزگ / tezig/**: ناو. ١. سڕی؛ کەرخی؛ بێهەستی ئەندام ٢. تەرزەی درشت ☰ ١. بی‌حسی ٢. تگرگ درشت

**تەزگا / tezga/**: ☜ تەژگا

**تەزنای / teznay/**: ☜ تەزاندن

**تەزو / tezû/**: ناو. تەزگ: ١. سڕی؛ کەرخی؛ چۆنیەتی خاو بوونەوە یان لە جم و جوول کەوتن بۆ تاوێک ‹تەزووی پیرێژن کوژاوە/ ئاویان لە جێ ماڵی ناوە «هەژار، *بۆکوردستان*»› ٢. مچوڕک؛ مووچرک ‹تەزووی گەرمم بە لەشدا دێ، ئەگەرچی/ تەزاندی شان و پیلم بەردی پارە «هێمن»› ٣. سۆزەی سەرما و بای سارد ٤. کەلیژ؛ شەوت؛ ئازارێکە لە گوێی ئاژەڵ و ڕەشەوڵاخدا پەیدا

دەبێ ٥. هێز؛ وزە ‹تەزووی کارەبا› ☰ ١. کرختی ٢. چگونگی تیر کشیدن اندام ٣. سوز سرما ۴. از بیماری‌های احشام ۵. توان

⊡ **تەزووی پیرێژن**: وشتری پیرێژن؛ بەفری پیرێژن؛ سەرمایەکی حەوت ڕۆژە لە ٢٠ هەتا ٢٦ی ڕەشەمە ☰ سرمایی هفت روزه از ٢٠ تا ٢۶ اسفند

⊡ **تەزوو پێداهاتن**: مچووڕک پێداهاتن ☰ مورمور شدن

**تەزەک** / tezek/: ناو. لۆمە؛ سەرکۆنە ☰ سرزنش

**تەزەندەر** / tezender/: ناوەڵناو. زەبەلاح؛ درێژ و ناقۆلا ☰ لندهور

**تەزی** / tezî/: ناوەڵناو. ١. سڕبوو؛ لەگۆچوو ٢. تازی؛ زۆر سارد، بەتایبەت بۆ خواردنەوە ‹ئاوا تەزی› ☰ ١. بی‌حس ٢. تگری

**تەزیای** / tezyay/: ☜ **تەزین**

**تەزیگ** / tezîg/: ☜ **تەزیو**

**تەزین** / tezîn/: چاوگ. تێنەپەر. //تەزیت؛ دەتەزی؛ بتەزە// تەزان؛ تەزیای؛ لە گۆ چوون؛ سڕ بوون؛ کەرخین؛ سست بوونی ئەندام ☰ بی‌حس شدن؛ خواب رفتن اندام

■ ناوەڵناوی بەرکاری: تەزیو/ چاوگی نەرێنی: نەتەزین

**تەزیو** / tezîw/: ناوەڵناو. تەزیگ؛ سڕ؛ سڕبوو؛ دۆخی ئەندامی هەست لێبڕاو ☰ بی‌حس شده

**تەزیوی** / tezîwî/: ناو. سڕی ☰ کرختی

▪ **تەزێن** / tezên-/: پاشەوشە. ئەوەی کاری تەزاندنە ‹سەرتەزێن؛ دڵتەزێن› ☰ بی‌حس کننده

**تەژ**[١] / tej/: ناو. ١. لوڕ؛ لوری؛ ژێرجلی بارەبەر ٢. کاریتە؛ شاتیر ☰ ١. عرقگیر ستور ٢. بالار

**تەژ**[٢]: ناوەڵناو. پڕ؛ تژ؛ تژی ☰ پُر

**تەژاندن** / tejandin/: چاوگ. گووشین ‹دەستیم تەژاند› ☰ فشردن

**تەژبی** / tejbî/: ناو. تەژبیات؛ هاووێنەیی؛ چۆنیەتی وێچوون ☰ تشبیه

⊡ **تەژبی کردن**: چواندن؛ شوبهاندن ☰ تشبیه کردن

**تەژبیات** / tejb(i)yat/: ☜ **تەژبی**

**تەژگ** / tejg/: ناو. جۆرێ کەتان یان قوماشی کەتانی ☰ نوعی پارچەی کتانی

**تەژگا** / tejga/: ناو. تەزگا؛ ئاگردان؛ ئاورگ ☰ آتشدان

**تەژنە** / tejne/: ☜ **تینو**[٢]

**تەژە**[١] / teje/: ناو. ١. کۆڵەکە؛ ستوون؛ ئەستوندەک ٢. ئالوودار؛ داری ڕایەڵی سەربان دەستەک ‹ئەمڕوانییە بن‌میچ و تەژەی سەربان› ٣. تەگە؛ سابرێن؛ ساورێن؛ تەجە ٤. یاری قەلەمنداری ☰ ١. ستون ٢. الوار سقف ٣. نهاز؛ تکه ۴. نوعی بازی

**تەژە**[٢]: ناوەڵناو. تەژەندەر؛ حۆل؛ زلی نالەبار ‹هەر تەژەیەکی ملهوڕ و مەندەبۆر و خاوەن زێڕ و زۆر بوایە، کیژۆلەی کوردی چاوشین و قژزێرینی هەڵبژاردەی بە دیارە هەڵدینا و بۆ خۆی دەبردن «هەژار، *شەرەفنامە*»› ☰ لندهور

**تەژەندەر** / tejender/: ☜ **تەژە**[٢]

**تەژی** / tejî/: ناوەڵناو. تەژ؛ پڕ؛ لیپاولیپ ☰ پُر؛ مالامال

**تەژیر** / tejîr/: ناو. ئاغەڵ؛ هۆڵی مەڕ ☰ آغُل

**تەس** / tes/: دەنگ. وشەیەکە بۆ لێخوڕین و وە ئاگا هێنانەوەی گاجووت ☰ کلمەی راندن گاو شخم‌زن

**تەسبێخ** / tesbêĥ/: ☜ **تەزبێح**

**تەسپۆک** / tespok/: ناو. سیخوڕ؛ جۆرێ ژیشکی زەلام ☰ سیخول؛ نوعی خارپُشت دُرُشت

**تەست** / test/: ↓

⊡ **تەست دانەوە**: بەرپەرچ دانەوە؛ پەرچم دانەوە؛

قسە بڕین 🇮🇷 در میان سخن آمدن

**تەسق** / tesq/: ☜ **تەسوق**

**تەسک** / tesk/: ئاوەڵناو. تەسکە: ١. تەنگ؛ بە بۆشایی، پانایی یان بەری کەمەوە ٢. کەمبەر؛ ناسک؛ بەرانبەری پان ٣. تەسکۆڵ؛ قەدباریک ‹تەسک و تەنک تەنکی/ هەناری بێ دەنکی «فولکلۆر»› 🇮🇷 ١. تنگ ٢. کم‌عرض ٣. باریک اندام

**تەسکوتڕووسک** / tesk û t(i)rûsk/: ئاوەڵناو. بەرتەنگ؛ باریک و تەسک ‹پێم مەڵێن ئەم دوو ژنەت بۆچییە تۆ شێخ ڕەزا!!/ شوکری بۆ تەسک و تڕووسکی و جەمیل بۆ زگوزا «شێخ ڕەزا»› 🇮🇷 کم‌عرض

**تەسکۆڵ** / teskoł/: ئاوەڵناو. تەسکۆلانە؛ باریکەڵە؛ ناسکۆڵ؛ تەسکەلانە؛ تەسکەلە؛ تەسکەلانە؛ تەسکەڵە؛ قەدباریک 🇮🇷 باریک اندام

**تەسکۆلانە** / teskołane/: ☜ **تەسکۆڵ**

**تەسکۆڵە** / teskołe/: ئاوەڵناو. ناسکنارنجی؛ تەسکۆلانە 🇮🇷 نازک‌نارنجی

**تەسکە** / teske/: ☜ **تەسك**

**تەسکەلانە** / teskelane/: ☜ **تەسکۆڵ**

**تەسکەلە** / teskele/: ☜ **تەسکۆڵ**

**تەسکەڵانە** / teskełane/: ☜ **تەسکۆڵ**

**تەسکەڵە** / teskełe/: ☜ **تەسکۆڵ**

**تەسلەخ** / teslex/: ئاوەڵناو. سووک و چرووک 🇮🇷 هرزە

**تەسلیم** / teslîm/: ناو. *[کینایە]* دۆخی دانەدەستەوە؛ مردن 🇮🇷 تسلیم؛ کنایە از جان سپردن

⊡ **تەسلیم بە خاک کردن:** *[کینایە]* مردوو ناشتن 🇮🇷 دفن کردن

**تەسمە** / tesme/: ناو. تاسمە؛ تەسوو؛ تەسووە؛ سیرمە؛ شریتێکی پان بۆ بەستن و زۆر کاری‌تر 🇮🇷 تسمە

**تەسمەلیچ** / tesmelîç/: ناو. خەزایی؛ ئایلەمەن 🇮🇷 سار صورتی

**تەسوق** / tesuq/: ئاوەڵناو. نۆبەر؛ تەسق؛ تازەهاتوو 🇮🇷 نوبر

**تەسو** / tesû/: ☜ **تەسمە**

**تەسووە** / tesûwe/: ☜ **تەسمە**

**تەسە** / tese/: ناو. ١. تەبەکی نان ٢. تەشتی هەویر شێلان ٣. دەسەناز؛ دەستەنداز؛ کۆسپی سەر ڕێگە ٤. ڕەت؛ دۆخی هەڵەنگووتن 🇮🇷 ١. طبق نان ٢. تشت خمیر ٣. دستانداز ۴. سکندری

**تەسەل** / tesel/: ئاوەڵناو. مڕ؛ تێر 🇮🇷 سیر

⊡ **تەسەل بوون:** تێر/ مڕ بوون 🇮🇷 سیر شدن

**تەسەلا** / tesela/: ناو. سەبووری؛ قنیات ‹دەستت بڕیوم لە هەموو لایێ/ بە هیچ کلووجێ تەسەلام نایێ «قانع»› 🇮🇷 شکیبایی؛ تسلی

**تەسەلی** / teselî/: ناو. مڕی؛ تێر و پڕی 🇮🇷 سیری

**تەسیار** / tesyar/: ناو. ئێشکگری کاروان 🇮🇷 نگهبان کاروان

**تەش** / teş/: ناو. ١. ئاگر؛ ئایەر؛ ئاور ٢. ☜ **تەشی** 🇮🇷 ١. آتش ٢. ☜ **تەشی**

**تەشاب** / teşab/: ☜ **تەشابی**

**تەشابی** / teşbî/: ناو. تەشاب؛ تەشاوی؛ تەشە؛ ڕۆچنە؛ کلاوڕۆژنە؛ بانجە؛ کولانجە 🇮🇷 روزنەی بام

**تەشاوی** / teşawî/: ☜ **تەشابی**

**تەشبریق** / teşb(i)rîq/: ناو. هەورەتریشقە؛ برووسکە 🇮🇷 آذرخش

**تەشبەرە** / teşbere/: ناو. کەللا؛ کەلا؛ هەڵمات؛ مەرمەڕ 🇮🇷 تیلە

**تەشبی** / teşbî/: ناو. تەشپی: ١. تاوان؛ قەرەبووی گوناح ٢. تەزبی؛ هاووێنەیی 🇮🇷 ١. تاوان ٢. تشبیە

**تەشبیترانە** / teşbît(i)řane/: ☜ **تەبەقەترانە**

**تەشبێترانە** / teşbêt(i)řane/: ☜ **تەبەقەترانە**

**تەشپی** / teşpî/: ناو. ١. بادیە؛ کاسەی دارین ٢. ☜ **تەشبی** ☰ ١. کاسەی چوبی ٢. ☜ **تەشبی**

**تەشپیترێن** / teşpît(i)řên/: ناوەڵناو. *[مەجاز]* زۆرخۆر؛ فرەخوەر ☰ پُرخور

**تەشپیلۆکە** / teşpîloke/: ناو. تەشپیلە؛ کاسەی دارینی گچکە ☰ کاسەی چوبی کوچک

**تەشپیلە** / teşpîle/: ☜ **تەشپیلۆکە**

**تەشت** / teşt/: ناو. سوێنە؛ ڕەمە؛ دۆڵ؛ دەوڵە؛ دۆڵە؛ دەفری گەورەی بنتەختی لێوار تەسک (زیاتر) بۆ شۆردنی جلوبەرگ ☰ تشت

**تەشتولکە** / teştûlke/: ناو. تەشتی چکۆلە ☰ تشتک

**تەشتیر** / teştîr/: ☜ **توشتیر**

**تەشخە** / teşxe/: ناو. تاقە؛ ڕف ☰ تاقچە

**تەشخەڵە** / teşxełe/: ☜ **تەشقەڵە**

**تەشخەڵەباز** / teşxełebaz/: ☜ **تەشقەڵەباز**

**تەشریفات** / teşrîfat/: ناو. بارگرانی؛ بەزموڕەزم؛ داب و دەستوور ☰ تشریفات

**تەشریفاتی** / teşrîfatî/: ناوەڵناو. ڕواڵەتی؛ فۆرمالیتە ☰ فُرمالیتە

**تەشرین** / teşrîn/: ☜ **تشرین**

**تەشق** / teşq/: ناو. تەوەشق: ١. بڵندایی؛ سەرترین یان زۆرترین ئاستی شتێک ‹ئەم سندمە گلینە بشکێنە تا بزانی/ ڕەمکێشی گش مەلانی و لە تەشقی عاسمانی «هەژار، *چوار نامیلکە*»› ٢. تەشک؛ توند و تیژی هەوا ‹سەرما تەشقی نەما؛ لە تەشقی گەرمایە چووم› ☰ ١. اوج آسمان ٢. شدت گرما یا سرما

▣ **تەشق شکان:** لە توندی و بەهێزی کەوتن ‹سەرما تەشقی شکا› ☰ از شدت و فشار کاستن

**تەشق نەمان:** توندی و گوشار نەمان ☰ شدت و فشار نماندن

**تەشقەڵە** / teşqełe/: ناو. تەشخەڵە؛ گەڕ؛ گزی؛ دەبە؛ کار یان ئاکارێک (وەک: پەلپ، گێچەڵ، گرموقاڵ و ...) بۆ تەنگەتاو کردنی مافی ئەوانیتر، یان لە ژێر کار دەرچوون ☰ شلتاق

**تەشقەڵەباز** / teşqełebaz/: ناوەڵناو. تەشخەڵەباز؛ دەبەکار؛ بێفەڕ ☰ شلتاق‌زن

**تەشک** / teşk/: ناو. ١. دەوان؛ بەرداوێن ٢. لا؛ تەنشت؛ پاڵ ٣. تەشکەڵ؛ داوێن ٤. لاکێش؛ لاکێشە ٥. *[پلار]* لنگ و لەتەر ‹تەشکی بەرەلایە!› ٦. *[پلار]* بەچک؛ بیچم ‹تەشکی مرێ!› ٧. ☜ **تەشق ـ٢** ☰ ١. دامان ٢. جنب؛ کنار ٣. دامن ٤. مستطیل ٥. لنگ ٦. سیما؛ قیافە ٧. ☜ **تەشق ـ٢**

**تەشکەبەرە** / teşkebere/: ناو. جول؛ پەلاس؛ پلاس ☰ پلاس

**تەشکەبەڕە** / teşkebeře/: ناو. بەڕەی درێژۆکە ☰ گلیم دراز

**تەشکەڵ** / teşkeł/: ناو. تەشک؛ داوێن ☰ دامن

**تەشگا** / teşga/: ناو. تەژگا؛ ئاورگ؛ ئاگردان ☰ آتشگاه

**تەشلەخە** / teşlexe/: ناو. هەڕەت و جەنگەی سەرما ☰ اوج سرما؛ شدت برودت

**تەشنەداری** / teşnedarî/: ناو. گیایەکە هەتوانی لێ دروست دەکەن ☰ گیاهی است از آن پماد می‌سازند

**تەشنی** / teşnî/: ناو. گەروو؛ قوڕگ ☰ گلو

**تەشوێ** / teşwê/: ناو. ترشتە؛ ترێشتە؛ تەپشوێ؛ تەپشۆ؛ تەپشوو؛ تەشوو؛ تەفشوێ؛ تەفشوو؛ تەفشی؛ تەمشوێ؛ تەمشوو؛ تەوشوێ؛ تەوشوو؛ تەوشی؛ تەوشێ؛ ئامرازێکی چەکوچ ئاسای دەم پان و تیژ بۆ داتاشینی چێو و بەرد ☰ تیشە

**تەشو** / teşû/: ☜ **تەشوێ**

**تەشە** / teşe/: ناو. ١. ☜ **تەشابی** ٢. تاقەت؛ توان؛ تابشت ☰ ١. ☜ **تەشابی** ٢. توان

**تەشەخوس** / teşexus/: ناو. ١. کەسایەتی ٢. دەمار و لووتبەرزی ☰ ١. شخصیت ٢. تکبُّر

**تەشەر / teşer/**: ناو. تانە؛ قسەی بە تێکوڵ 🇸 تَشَر
⊡ **تەشەر لێدان**: تانە لێدان؛ قسە پێ‌کردن 🇸 تشر زدن

**تەشەن / teşen/**: ☜ تەشەنە

**تەشەنا / teşena/**: ☜ تەشەنە

**تەشەنگ / teşeng/**: ئاوەڵناو. پڕاوپڕ؛ کەیل 🇸 لبریز

**تەشەنە / teşene/**: ناو. تەشەن؛ تەشەنا: ١. ڕەوتی تێچوون، بڵاوە بوون و گەشە کردنی میکرۆب و مشەخۆر لە برین یا ئەندامێکی زیندووی خانەخوێ ٢. ڕەوتی گرتنەوە و زیاد کردنی کوان و زیپکە ٣. ڕەوتی ڕەگاژۆ کردن و پەرە ساندن 🇸 ١. عفونت ٢. حالت یا فرایند بزرگ شدن زخم ٣. انتشار؛ سرایت
⊡ **تەشەنە کردن**: پەرەساندن؛ زیاد کردن 🇸 سرایت کردن؛ شدت یافتن

**تەشەنەک / teşenek/**: ناو. بان مەلاشوو 🇸 جان‌دانە

**تەشەنەکردوو / teşenekirdû/**: ئاوەڵناو. هاریای؛ پەرەگرتوو (زام یان نەخۆشی) 🇸 پیشرفتە (زخم یا بیماری)

**تەشی / teşî/**: ناو. تەش؛ نەتەرە؛ ئامرازی ساکاری بەن با دان 🇸 دوک نخریسی
⊡ **تەشی ڕستن**: ١. بە تەشی بادانی لۆکە و خوری ٢. */کینایە/* زمان‌لووسی و مەرایی کردن ‹ڕاستە ئەویش وەک هەموو دەست و پێوەندی شایان، زۆری تەشی لە بەر شاعەبباس ڕستووە و بە بەژن و بالای خوێندەوە› 🇸 ١. دوک ریسیدن ٢. تملق کردن

**تەشی‌تەشی / teşîteşî/**: ناو. گەمەیەکی لاوانی گوندە 🇸 از بازی‌های جوانان روستایی

**تەشیرە / teşîre/**: ناو. ڕەوڕەوە؛ سێپێچکەی منداڵ کە پێ فێرەڕۆیشتن دەبێ 🇸 روروک

**تەشی‌ڕێس / teşîřês/**: ناو. ١. لەتەرەڕێسە؛ کەسێ کە بە تەشی، خوری بادەدا ‹تەشی‌ڕێس، تەشی‌ڕێس بێ، بە کلکی کەریش بێ ئەیڕێسێت! «مەسەل»› ٢. */کینایە/* زمان‌لووس و مەرایی‌کەر ٣. */کینایە/* زۆربڵێ 🇸 ١. دوک‌ریس ٢. متملق ٣. وراج

**تەشی‌ڕێسی / teşîřêsî/**: ناو. ١. کار و ڕەوتی خەرەک ڕستن؛ نەتەرە ڕستن؛ بە تەشی بادانی کوڵکە ٢. */کینایە/* زمان‌لووسی و مەرایی 🇸 ١. دوک‌ریسی ٢. تملق و ریا

**تەشیشی / teşîşî/**: ناو. کار و ڕەوتی چاوەڕوانی کردنی کەسێک بە دڵ‌نگەرانییەوە 🇸 انتظار پر از تشویش و نگرانی

**تەشیکە / teşîke/**: ناو. موغموغە؛ مێشوولەی لاقدرێژ کە هەندێکیان سەرپشتیان کوڵکنە 🇸 پشّەی بزرگ

**تەشیلان / teşîlan/**: ناو. مێشان؛ مێشێن؛ پلان؛ هەڵماتان؛ گەمەی مەرمەڕێن 🇸 تیلەبازی

**تەشیلە / teşîle/**: ناو. ١. هەڵمات؛ کەللا؛ کەلا ٢. غەرغەرە؛ غەرغەرە ٣. خوری ئامادەی ڕستن 🇸 ١. تیلە ٢. قرقرە ٣. پشم آمادەی ریس

**تەشیمل / teşîmil/**: ناو. کولیچەگیواو؛ ئالفەگیایەکی لاسک بەرزی گوڵ زەرد و سووری لە پاڵ یەکە بە ڕیشەی زۆر تاڵەوە کە دەرمانێکە 🇸 جنتیانا؛ کوشار

**تەشیۆک / teşyok/**: ناو. جۆرێ هەڵپەڕکێ 🇸 نوعی رقص گروهی

**تەشی‌هەڵکەر / teşîhelker/**: ناو. ئامرازێکە لە قوڕ و دار بۆ بەن لە سەر هەڵکردن 🇸 پایەی دوک

**تەعارف / te'arif/**: ناو. ١. خوڵک؛ گازی بۆ بەشدار بوون ‹چای تەعارف بکە لە میوانەکان› ٢. پێشکەشی؛ دیاری ‹چەند جارێ تەعارفی لەتەکمانا بووە› ٣. قسە و خوڵکی سەرزارەکی، بە بێ کردەوە ‹ئەم قسانە تەعارفن، ئاخری چەند؟› 🇸 ١. دعوت ٢. هدیە ٣. تعارُف

**تەعتیل‌کراو / te'tîlk(i)raw/**: ئاوەڵناو. هەڵپێچراو؛

داخراو 🇮🇷 بسته شده

**تەعل** / te'l/: ☜ **تاڵ**[٢]

**تەعەو** / te'ew/: ناو. تاوک؛ تایلە؛ دارێکی لێڕەوارە، بەرێکی بچووک دەگرێ 🇮🇷 درخت تاغ؛ داغداغان؛ تاقوت

**تەغار** / teğar/: ☜ **تەخار**

**تەغاراو** / teğaraw/: ناو. ١. ☜ **تەخاراو** ٢. دەفری ئاوی پینەچی 🇮🇷 ١. ☜ **تەخاراو** ٢. کاسەی آب پینەدوز

**تەغژ** / teğj/: ناو. ١. جۆرێ ترێڕەشکە ٢. تلّپە کشمیشی سرکە لێگیراو 🇮🇷 ١. نوعی انگور سیاه ٢. تفالەی سرکەی کشمش

**تەغمە** / teğme/: ناو. تاغمە؛ تەخمە؛ تەمخە؛ شەقڵی ئاژەڵ داخ کردن 🇮🇷 مُهر داغ کردن حیوانات

**تەغەر** / teğer/: ناوەلکار. زۆرتر؛ زیاتر 🇮🇷 بیشتر

**تەف** / tef/: ناو. شەگگە؛ میرهاتنی جگ؛ لە سەر باری لووس چەقینی قاب 🇮🇷 حالت بر روی صاف ایستادەی قاب

**تەفاری** / tefarî/: ناو. جۆرێ هەنجیر 🇮🇷 نوعی انجیر

**تەفاریک** / tefarîk/: ناو. ١. ڕەنجبەری تازەهاتوو ٢. کەسێ کە مەزرای لە گوندێکی دیکە هەبێ ٣. هەنجیری کێوی 🇮🇷 ١. تازە رعیت ٢. آنکە مزرعەاش در روستای دیگر است ٣. انجیر کوهی

**تەفایە** / tefaye/: ناو. ١. مقەڵی؛ مەنقەڵی؛ ئاگردانی بچووک لە کانزا ٢. وجاخ؛ تفک؛ ئاگردانی موبەق 🇮🇷 ١. منقل ٢. أجاق

**تەفت** / teft/: ناو. قەرتاڵە 🇮🇷 سبد میوه

**تەفتە** / tefte/: ناو. چەفتە؛ چەفیە؛ جۆرێ دەسماڵە، لە ملی دەهاڵێن 🇮🇷 چفیه

**تەفتی** / teftî/: ناو. گەنمی وەک برویش کوتراو 🇮🇷 گندم نیمکوب

**تەفتیک** / teftîk/: ناو. کووروو؛ کوڵکەی نەرمی ژێرەوەی خوری و مووی بزن 🇮🇷 کُرک

**تەفرنج** / tefrinc/: ناو. تەفرنجە؛ سەرنج؛ سەرنجە 🇮🇷 دقت؛ توجه

⊡ **تەفرنج دان:** سەرنج دان؛ ڕوو تێکردن، گوێ ڕاگرتن و هۆش دان بە کەسێک یان شتێک 🇮🇷 دقت و توجه کردن

**تەفرنجە** / tefrince/: ☜ **تەفرنج**

**تەفروتونا** / tefr û tûna/: ناوەلناو. توونا؛ فەوتاوی یەکجارەکی ‹نیفاق و کینە دەرحەق یەک هەتاکەی بەسیە وا مردین/ خوایە تەفروتوونا بێ ئەوی دڵ پیس و ناپاکە «بێکەس»› 🇮🇷 نیست و نابود

**تەفروتوناکراو** / tefr û tûnak(i)raw/: ناوەلناو. لەناوچوو(گ)؛ لەنێوچوو 🇮🇷 نابود شده

**تەفرە** / tefre/: ناو. ١. فریو؛ کار و ڕەوتی خاپاندن؛ هەڵخەڵەتاندن ‹بەس تەفرەم بە! بەس بە ئەفسوون گێلم کە!/ بەس کوێرم کە! ئەمجا دوشمن‌شێلم کە! «گۆران»› ٢. دەستاودەست؛ حەواڵەبەگەواڵە؛ کار و ڕەوتی خۆ لادان لە جێبەجێ کردنی کارێ کە داوا کراوە 🇮🇷 ١. فریب ٢. طفره

⊡ **تەفرە خواردن:** هەڵخەڵەتان؛ لە خشتە چوون؛ بە فریو چوون ‹سێهەم: بە درۆی کەس تەفرە مەخۆ!/ بە شوێن کردەوەی حەرامدا مەچۆ! «پیرەمێرد»› 🇮🇷 فریب خوردن

**تەفرە چوون:** ئێستا و تاوێ تر کردن؛ حەواڵە بە گەواڵە کردن ‹کارەکە ڕێ ناخا، هەر تەفرە ئەچێ› 🇮🇷 امروز و فردا کردن

**تەفرە دان:** ١. فریو دان؛ خاپاندن ‹کێ تەفەرەی داوی؟ بەردی لێ باری «فولکلۆر»› ٢. حەواڵەبەگەواڵە پێ‌کردن ‹ئەم کارە بۆ تەفەرە دان ناشێ› 🇮🇷 ١. فریب دادن ٢. امروز و فردا کردن

**تەفرەدراو** / tefred(i)raw/: ناوەلناو. خەڵەتاو؛

فریودراو ☰ فریب‌خورده

**تـەفرەدەر / tefreder/**: ئاوەڵناو. هەڵخەڵەتێن؛ فریودەر ☰ فریبکار

**تەفزک / tefzik/**: ☜ **تەڤسك**

**تەفسە / tefse/**: ناو. پەڵـەی دەموچـاو ☰ لکـەی صورت

**تەفشک / tefşik/**: ناو. ١. تۆلاشی بەرد یان دار ٢. کرێش؛ کرێژە سەر ☰ ١. تراشەی سنگ و چوب ٢. شورەی سر

**تەفشوێ / tefş(i)wê/**: ☜ **تەشوێ**

**تەفشو / tefşû/**: ☜ **تەشوێ**

**تەفشی / tefşî/**: ☜ **تەشوێ**

**تـەفک / tefk/**: ئاوەڵناو. بێ‌ئـەقڵ؛ ناتێگەیشـتوو؛ گێلۆکە؛ دەبەنگ ☰ نادان

**تەفەش / tefeş/**: ئاوەڵناو. خاین؛ خۆفرۆش ☰ خائن

**تـەڤ[1] / tev/**: ئاوەڵکار. هەموو؛ پاک؛ گش ☰ همـه؛ تماماً

**تەڤ[2]**: ئامراز. دەگەڵ؛ پێرا ☰ با؛ حرف همراهی

**تەڤ ـ[3]**: پێشگر. ل هەڤ؛ لە یەک؛ تێک ‹تەڤلهەڤ› ☰ به هم؛ در هم

⊡ **تەڤ دان**: تێکەڵ کردن؛ لێکدان؛ تێکدان ☰ به هم زدن؛ درهم آمیختن

**تەڤا / teva/**: ناو. وزە؛ هێز؛ تابشت؛ توان ☰ تـاب؛ توان

**تەڤایی / tevayî/**: ☜ **تەبایی**

**تەڤبیر / tevbîr/**: ناو. تەڤـدیر؛ تـەگبیر؛ شـیرەت؛ ڕاوێژ؛ پرس‌وڕا ☰ تدبیر

**تەڤتەڤیک / tevtevîk/**: ناو. کـەمان؛ کەمانچـە ☰ کمانچه

**تەڤجڤان / tevc(i)van/**: ناو. پەیوەندی زۆر نزیـک ☰ رابطەی نزدیک

**تەڤدا / tevda/**: ئاوەڵناو. زیانـەخورۆ؛ زەرەردەر ☰ مُضر

**تەڤدیر / tevdîr/**: ☜ **تەڤبیر**

**تەڤر / tevr/**: ناو. ١. تەور؛ بیور؛ باڵتە ٢. ڕووبەنـد ☰ ١. تبر ٢. روبند

**تەڤرزین / tevrzîn/**: ☜ **تەورزین**

**تەڤری / tevrî/**: ناو. ١. گیایەکـە ٢. دارێکـە لـە بەلالووک دەکا ☰ ١. گیاهی است ٢. درختی شـبیه آلبالوی کوهی

**تەڤز / tevz/**: ناو. تیز؛ گاڵتە ☰ شوخی

**تەڤزانـدن / tevzandin/**: چـاوگ. داپۆشین؛ داپۆشان ☰ پوشیدن (روی چیزی)

**تەڤزک / tevzik/**: ناو. جـۆرێ هـەنجیر ☰ نـوعی انجیر

**تەڤزی / tevzî/**: ئاوەڵناو. ١. تـەزی؛ زۆر سـارد ٢. تەزیو؛ سڕ؛ لەگۆچوو ☰ ١. تگری ٢. بی‌حس

**تەڤزین / tevzîn/**: چاوگ. ١. تەزین؛ سڕ بوون؛ لە گۆ چوون؛ بێ‌هەست بوون (ئەنـدام) ٢. داپۆشران؛ داپۆشیان ٣. نەخۆش کەوتن و کەلەلا بوون ☰ ١. بی‌حس شدن ٢. پوشیده شدن ٣. بیمار شـدن و از پـا افتادن

**تـەڤژین[1] / tevjîn/**: چاوگ. پێ‌بوونی ئاگر ☰ روشن شدن آتش

**تەڤژین[2]**: ناو. ١. شـیاکە؛ ڕیـخ؛ شـیاکەی شـل و تـەڕی ڕەشـەوڵاخ ٢. بەلەفیـرە؛ زگەشـۆرە؛ زگ‌چوون؛ شوولین ☰ ١. سرگین ٢. اسهال

**تەڤسـک / tevsik/**: نـاو. تـەفزک؛ تـەفاریک؛ هەنجیرەکێوی ☰ انجیر کوهی

**تەڤش / tevş/**: ناو. قـەمچ؛ چـەوی پـان ☰ قطعـه سنگ پهن

**تەڤگەر / tevger/**: ناو. بزاڤ؛ بزاو ☰ جُنبش

**تەڤگـەڕ / tevgeř/**: ئاوەڵناو. هێـدی‌نـەدەر؛ دانەسەکناو؛ هەمیشـە لـە جووڵـە و بزووتنـدا ☰ بی‌آرام و سکون

**تەڤل / tevl/**: ئاوەڵناو. ئاوێتە؛ تێکەڵ ☰ مخلوط

**تەڤلار / tevlar/**: ئاوەڵناو. کول؛ نەبڕ ☳ کُند

**تەڤلهەف[1] / tevlihef/**: ئاوەڵناو. تێکەڵ-پێکەڵ؛ لێکدراو؛ تێکهەڵشێلدراو ☳ درهم آمیخته

**تەڤلهەف[2]**: ئاوەڵکار. پێکەوە ☳ با هم

**تەڤلهەڤ / tevl(i)hev/**: ئاوەڵناو. تێکەڵ؛ تێکەڵاو؛ لێکدراو؛ ئاوێتە ☳ آمیخته؛ قاطی

**تەڤلهەڤی / tevl(i)hevî/**: ناو. تێکەڵی؛ تێکەڵاوی ☳ آشفتگی

**تەڤلی / tevlî/**: ناو. های؛ ئاگاداری؛ خەبەرداری ☳ آگاهی

**تەڤن / tevn/**: ناو. تەون: ١. کاری (مافوور و بەڕە) تەنین ٢. جاڵ؛ داوی لە موو بۆ ڕاوی پەلەوەر ☳ ١. عمل بافتن ٢. نوعی دام پرندگان

**تەڤناپیرێ / tevnapîrê/**: ☜ تەڤنك

**تەڤنپیر / tevnpîr/**: ☜ تەڤنك

**تەڤنپێچ / tevnpêç/**: ناو. جاڵجاڵووکە؛ جۆلاتەنە ☳ عنکبوت

**تەڤنك / tevnik/**: ناو. تەڤناپیرێ؛ تەڤنپیر؛ تەڤنۆک؛ تەڤنەپیر؛ تەڤنەجنۆکە؛ داوی جۆلاتەنە؛ داوی جاڵجاڵووکە ☳ تار عنکبوت

**تەڤنۆک / tevnok/**: ☜ تەڤنك

**تەڤنەپیر / tevnepîr/**: ☜ تەڤنك

**تەڤنەجنۆکە / tevnec(i)noke/**: ☜ تەڤنك

**تەڤو / tevû/**: ئاوەڵکار. تەقوو؛ تەقاو؛ بەڵکوو؛ بەشکوو ☳ بلکه

**تەڤەر / tever/**: ناو. تەوەرزین ☳ تبرزین

**تەڤەنی / tevenî/**: ☜ تەوەن

**تەڤی / tevî/**: ئاوەڵکار. پێکەوە؛ وێکڕا ☳ باهم

**تەق[1] / teq/**: ناو. ١. دیق؛ نەخۆشی سیل ٢. شەق؛ تلیش ☳ ١. دِق ٢. شکاف

⊡ **تەق کردن**: ١. ☜ **تەقە کردن-٢** ٢. *[منداڵانە]* لێدان ‹پشیلەکە بەخە؛ تەقی مەکە!› ☳ ١. ☜ **تەقە کردن-٢** ٢. زدن

**تەق[2]**: ئاوەڵناو. تاق؛ تاک؛ تەنیا ☳ تک؛ تنها

⊡ **تەقی تەنێ**: تەنیای بێهەواڵ ☳ تک و تنها

**تەق[3]**: دەنگ. ١. دەنگی تەقین ٢. دەنگی ڕەق وە ڕەق کەوتن ‹تەق لە درگام دا› ☳ ١. صدای انفجار ٢. تِق؛ صدای بهم خوردن

⊡ **تەق دان**: ☜ **تەقە دان**

**تەقا[1] / teqa/**: ناو. لاپاڵی لێژ و ڕەقەن و خزی کێو و شاخ کە کەمتر گیای لێ دەڕوێ و هاتوچۆ پێدا کردنی ئەستەمە ‹مەهێڵە بەرخەکان بچن بەرەو تەقاکە!› ☳ کمرکش دارای شیب تُند و لیز کوه

**تەقا[2]**: ئاوەڵکار. تەقاو: ١. بەڵکوو؛ بەشکا ٢. ئەوە هاتوو ☳ ١. بلکه ٢. فرضاً

**تەقالا / teqala/**: ناو. تەقەللا؛ کۆشش؛ هەوڵ ☳ کوشش

⊡ **تەقالا دان/ کردن**: هەوڵ دان؛ ماندوو بوون بە کارێکەوە ☳ کوشش کردن

**تەقالادەر / teqalader/**: ئاوەڵناو. تێکۆشەر؛ هەوڵدەر ☳ تلاشگر

**تەقالك / teqalik/**: ناو. ١. کلکە تەشی؛ دارێکی گرۆڤەری کونە دە کلکی تەشی دەکرێ ٢. خڕی پانی پچووک ٣. قاشە ئاروو لە پانەوە؛ قاشی خڕی خەیار ☳ ١. پایەی دوک ٢. قرص مانندِ کوچک ٣. قاچ گردِ خیار

**تەقالە / teqale/**: ناو. چەقالە؛ فەریکی بادام و قەیسی ☳ چغاله

**تەقان / teqan/**: چاوگ. تێنەپەر. //تەقای؛ دەتەقێ؛ بتەقێ// تەقیان: ١. تەقین؛ تۆقین ٢. بەر بوون (کانی) ‹سەراوەکەی ڕوانسەر ئیمساڵ نەتەقی› ٣. لێک دان؛ لێک کەوتن ☳ ١. ترکیدن ٢. جوشیدن چشمه ٣. به هم خوردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: تەقاو/ چاوگی نەرێنی: نەتەقان

**تەقاندن / teqandin**/: چاوگ. تێپەڕ. //تەقاندت؛ دەتەقێنی؛ بتەقێنە// تەقنای: ١. ترەقاندن؛ بوونە هۆی قەڵشان یان درز بردن یا لێک جیا بوونەوەی شتێک ٢. چەک ئاور دان ‹ئەو گوللەیە تەقاندت/ بە دڵ منا چەقاندت «قانع»› ٣. پاک کردن؛ شەن و کەو کردن ٤. ڕاونان؛ ڕەتاندن ‹دەمتەقێنن چەشنی ڕێوی بەندەنێ/ ئەو سەگانە لای کونیشم نادەنێ! «هێمن»› ٥. تەقە لێ‌هێنانی جومگە و ماسوولکەی لەش بۆ ڕەواندنی ئێش و ماندوویی ☰ ١. ترکاندن ٢. شلیک کردن ٣. بوجاری کردن ۴. دنبال کردن ۵. صدا از مفاصل درآوردن
■ ئاوەڵناوی بەرکاری: تەقێندراو/ چاوگی نەرێنی: نەتەقاندن

**تەقاندنەوە / teqand(i)newe**/: چاوگ. تێپەڕ. //تەقاندتەوە؛ دەتەقێنیەوە؛ بتەقێنەوە// توقانن: ١. بە بێژنگ و کەودا کردنی دەغڵ بۆ بەرد و قەسەڵ لێ گرتن ٢. دیسانەوە تەقاندن ٣. تەقاندنی چەکەمەنی ٤. /کینایە/ گەڕان و پشکنینی زۆر ‹دنیام تەقاندەوە، نەمدۆزییەوە› ☰ ١. بوجاری کردن ٢. دوبارە ترکاندن ٣. منفجر کردن ۴. بسیار جُستن
■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەتەقاندنەوە

**تەقانن / teqanin**/: چاوگ. تەقاندن: ١. تەقاندنەوە ٢. لە بێژنگ دان ٣. نووساندن بە تەنیشت یەکترەوە ٤. گەڕانی ولات بە شوێن کەسێ یان شتێکدا ☰ ١. ترکاندن ٢. بوجاری کردن ٣. به هم چسپاندن ۴. جستجو کردن

**تەقانەوە / teqanewe**/: ☜ **تەقینەوە**[1]

**تەقاو**[1] / **teqaw**/: ئاوەڵناو. تەقیو؛ تەقیاگ ☰ منفجر شده

**تەقاو**[2]: ☜ **تەقا**[2]

**تەقاوی / teqawî**/: ناو. کاری شت بە شت گۆڕینەوە ☰ پایاپای

**تەقاویت / teqawît**/: ئاوەڵناو. کارکەنار؛ وەنیشتە؛ لە کار کەوتەی هەڵپەساردە ☰ بازنشسته

**تەقای / teqay**/: ☜ **تەقین**

**تەقتەق**[1] / **teqteq**/: ناو. زەوی بەردینە؛ زەوی بنی بەرد و ڕەقەنە ‹دەخیلت بم لە شاخ و بەرد و تەقتەق/ ملم ئەشکێ ئیشارەم کە بە تەق تەق «حەمدی»› ☰ زمین سنگی

**تەق ـ تەق**[2]: ئاوەڵکار. بە تەقەی یەک لە سەر یەک ‹... من تەق ـ تەق لە درگام دا «مارف ئاغایی»› ☰ تق ـ تق

**تەقتەقان / teqteqan**/: ناو. ١. پلیکان لە بەردی خۆڕست ٢. ڕەقەن؛ زەوینی بەردینە ☰ ١. پلەمەی سنگ طبیعی ٢. زمین یکپارچە سنگ

**تەقتەقۆک / teqteqok**/: ☜ **ئاژنە ـ١**

**تەقتەقە / teqteqe**/: ناو. جۆرێ کەوشی ناڵچە بەرز ☰ نوعی کفش زنانه

**تەقتەقەتاوێر / teqteqetawêr**/: ناو. تەختەبەرد؛ تاوێرە بەرد ☰ تختەسنگ

**تەقتەقی / teqteqî**/: ناو. شمشمک؛ تەق‌تەقیلە ☰ کفش بچەگانه

**تەقتەقیلە / teqteqîle**/: ناو. قاپقاپ؛ کەوشی دار؛ پێڵاوی لە دار؛ سۆلی دارین ☰ کفش چوبی

**تەقژین / teqjîn**/: ناو. پەین؛ پەیین ☰ پِهِن

**تەققە / teqqe**/: دەنگەناو. تەقە: ١. دەنگی لێک کەوتنی دوو شتی ڕەق ٢. دەنگی تەقاندنی تفەنگ ٣. /کینایە/ شەڕ بە چەکی گەرم ☰ ١. صدای به هم خوردن دو شیئ سخت ٢. صدای شلیک تفنگ ٣. جنگ با اسلحەی گرم

**تەقلان / teqlan**/: ناو. شۆڕش؛ ڕاپەڕین ☰ قیام

**تەقلدامێ / teqildamê**/: ناو. ١. پای دیوار؛ قەراغ دیوار ٢. لێواری دیوار ☰ ١. پای دیوار ٢. لبەی دیوار

**تەقلە / teqle**/: ناو. ١. تەقیلە؛ کڵاوی لە پەڕۆ یان دەزوو ٢. هەنجیری کاڵی وەریو ٣. جەواڵی

گەورە کە سەرێکی بە ناو خۆیدا دەچێ و لە کاتی باراندا وەک کەپەنک بە سەریدا دەدەن ٤. بلـق؛ تۆقلە ☰ ١. کلاه پارچەای یا نخی ٢. انجیر نـارس از درخت افتاده ٣. نوعی بارانگیر ۴. حُباب

**تەقلەدەو** / teqledew/: ناو. تەق‌ودەو؛ هەڕا ـ هەڕا؛ کاری شوێن گرتن و بە دوای کارێکـدا چـوون ☰ پیگیری و دوندگی

**تەقلین** / teqlîn/: چاوگ. خلیسکان؛ شـەمتین ☰ لیز خوردن؛ لغزیدن

**تەقڵ‌وشەقەڵ** / teqł û şeqeł/: ناو. بێگار ☰ بیگار

**تەقڵۆکـە** / teqłoke/: نـاو. تەلۆکـــە؛ گیاترۆقـــە؛ گیایەکـە نیـو میتـر لـە زەوی بـەرز دەبێتـەوە، لاسقەکەی سپییە و گوڵـی زەرد دەکـا، بـەرێکی ورد دەگرێ، دستی پێدا بێنی دەتەقێ ☰ گیـاهی است

**تەقڵە** / teqłe/: نـاو. ١. جلیـت ٢. جلێتانـێ ٣. ســەرمەقولات؛ کــاری خــۆ هەڵــگێڕانەوە بــە پشت‌وڕوودا ‹قاسپەی کەو لە کێو، تەقڵـەی بـاز لـە دەشــت/ تـا کوردســتان بـێ لـە کوێیـە بەهەشـت «هەژار»› ٤. تەقڵۆکە؛ تەلۆکە ☰ ١. چوب کوچـک بازی سوارکاران ٢. بازی سوارکاران با چـوب کوچـک ٣. پُشتک ۴. گیاهی است

⊡ **تەقڵە لێدان**: سەرمەقولات دان؛ سـەرموقولانج دان؛ خۆ ئاوەژوو کردنـەوە لـە فڕینـدا یـان لـە کاتی باز بردندا ☰ پُشتک زدن

**تەقڵەباز** / teqłebaz/: ناوەڵناو. ١. تایبەتمەنـدی ئەوەی کە لـە کـاتی ڕۆیـین یـان فڕینـدا خـۆی ئاوەژوو دەکاتەوە ‹کۆترەباریکـە شـای تەقڵـەبازان/ قاسپەی خاسەکەو لـە چیـا و ڕازان «حـەقیقی»› ٢. *[کنایە]* بە فێڵ و تەڵەکە ☰ ١. معلق‌زن ٢. فریبکار

**تەقڵەبازی** / tełebazî/: ناو. دەکبـووز؛ دەقلـووس؛ تەقلە ☰ پُشتک

**تەقڵـــەدەو** / teqłedew/: نـــاو. تەقڵـــــەکوت؛ تەقلەودەو؛ هەڵاتن بە پڕتاو ☰ عمل سریع دویدن

**تەقڵەکوت** / teqłekut/: ناوەڵکار. بە پڕتاو ☰ شتابان

**تەقڵەودەو** / teqłewdew/: ☚ تەقڵەدەو

**تەقن** / teqin/: نـاو. جێگەی پڕ لە قـوڕ و لیتـە ☰ لجنزار

**تەقنای** / teqnay/: ☚ تەقاندن

**تەقنایوە** / teqnaywe/: ☚ ترەکاندن

**تەقەوپۆقە** / teq û toq/: ☚ تەق‌وپۆق

**تـەق‌وپۆق** / teq û poq/: دەنگـەناو. تـەق‌وتـۆق؛ تەقەوپۆقە؛ تەقەتەقی زۆر ☰ تق‌وتوق

**تەق‌وتۆق** / teq û toq/: ☚ تەق‌وپۆق

**تـەق‌ودەو** / teq û dew/: ناو. ١. تـەق‌وڕەو؛ کـۆچی بە کۆمەڵ لە ترسان ٢. تەقلەدەو؛ هەوڵ و تەقالا؛ هەڕا ـ هەڕا ‹ئاسـایش نـەیرم، نـە ڕووژ و نـە شـەو/ سوب تا ئیوارە هامە تەق‌ودەو «شـامی»› ☰ ١. کـوچ گروهی ٢. تکاپو

**تـەق‌وڕەق** / teq û řeq/: ئاوەڵـناو. بـەتاڵ؛ بـەبێ کەل‌وپەلی پێویست ‹ماڵی تەق‌وڕەق› ☰ خـالی از وسیله

**تەق‌وڕەو** / teq û řew/: ☚ تەق‌ودەو ـ١

**تەق‌ولەق**[1] / teq û leq/: ئاوەڵـناو. ناتـەواو؛ سـەقەت ‹شیرکەت دانەخراوە، بەلام تەولەقە› ☰ ناقص

**تەق‌ولەق**[2]: ئاوەڵکار. بە شێوەیەکی ناتەواو ‹تەولەق کار دەکەین› ☰ ناقص

**تەقوو**[1] / teqû/: ئاوەڵکار. تەقا؛ بەشکا ☰ فرضاً

**تەقوو**[2]: دەنگ. پەکوو؛ حـەیف و خەسـار؛ وشـەی خەمخۆری ‹تەقوو لەو دەرفەتە زێڕینە وا بە خەسـار چوو!› ☰ اُف؛ کلمەی حسرت

**تەقە** / teqe/: دەنگەناو. ١. دەنگـی وێـک‌کـەوتنی شتی ڕەق و سـەخت ‹تەقـەی ددان› ٢. دەنگـی چەک و تەقەمـەنی ‹تەقـەی تفـەنگ› ٣. *[مـەجاز]* هەواڵ؛ دەنگۆ ☰ ١. صدای افتادن شـیئ سـخت ٢. تیراندازی ٣. خبر؛ شایعە

▣ **تەقەی مازوو:** سەرەتای هەرەتی مازوو چنینەوە ‹بەراوردم تـەواوە/ تەقـەی مـازوو شـكاوە/ كێتـان كوڕی مەیدانە/ یاللا مازووچنانە! «قانع»› ⬛ قانع

▣ **تەقە بوون:** شەڕ بوون بە چەكی گەرم ⬛ جنگ بودن با اسلحەی گرم

**تەقە تێكەوتن:** ١. دەست بە هەلاتن كردنی بە كۆمـەڵ ٢. نـەمان و بـڕانی شـیر لـە گـوانی حەیوان ‹مانگاكەمان تەقەی تێكەوتووە و چـی‌دی شیر نادا› ⬛ ١. گروهی فرار كردن ٢. خشک شدن شیر حیوان

**تەقە داكەوتن:** خەبەر و دەنگۆ بـلاو بوونـەوە ⬛ شایع شدن

**تەقە دان:** تەق دان؛ تەقە لێدان؛ لە درگا دان ⬛ در زدن

**تەقە قەومان:** ئـاوری شـەڕ هەلایسـان؛ شـەڕ دەسپێكردن ⬛ جنگ درگرفتن

**تەقە كردن:** ١. فیشـەک دەركـردن ٢. *[مەجاز]* تەق كردن؛ شەق بردن لە داخا؛ دیق كردن ٣. تەقە لە شتەوە دەرهێنان ⬛ ١. تیراندازی كردن ٢. از غصه دق كردن ٣. تق‌وتوق كردن

**تەقە لە درگاوە هێنان:** تەقە دان لە درگـا؛ درگـا كوتان ⬛ در زدن

**تەقە لێ برین:** ☜ **تەقە لێ‌هێنان**

**تەقە لێدان:** ١. ☜ **تەقە دان** ٢. *[مەجاز]* كـەم كردنـەوەی نـرخ ٣. سـفت و قـایم كردنـەوە (بەتایبەت ئەوی بە چەكوش و شتی وا بكـرێ) ⬛ ١. ☜ **تەقە دان** ٢. تخفیف دادن ٣. كوبیدن

**تەقە لێ كردن:** گوللە پێوە نان ⬛ كسی را با تیـر زدن

**تەقە لێ هێنان:** *[كینایە]* تەقە لێ بـڕین: ١. بـنی شتێک دەرهێنان؛ تەواو كردنی شـتێک ‹هـەتا تەقەی لە قابلەمە نەهێنا، لە سەری هەڵنەستا› ٢. تەقلە لە بن هێنـان؛ تـەواو كـردن و بـە ئاكـام گەیاندنی كارێک ⬛ ١. ته چیـزی را در آوردن ٢. كاری را به انجام رسانیدن

**تەقە وەستان:** شەڕ وەستان؛ ئاگربەس بـوون ⬛ آتش‌بس شدن

**تەقەی سەر(ی كەسێ) هاتن:** *[مەجاز]* هاگا لە هیچ نەبوون؛ بێ‌خەبەر بوون ⬛ از عالم و آدم بی‌خبـر بودن

**بوونە تەقە:** شەڕ قەومان ⬛ جنگ درگرفتن

**تەقەبەس / teqebes/:** ناو. خوێنبـەس؛ ئاگربـەس ⬛ آتش‌بس

**تەقەت / teqet/:** ناوەڵناو. وەشـارتی؛ وەشـێراو؛ تاقەت ⬛ پنهان شده

▣ **تەقەت كردن:** شـاردنەوە؛ داشـاردن ⬛ پنهـان كردن

**تەقەتۆرە / teqetore/:** ☜ **تەقەفیڕە**

**تەقەتەق / teqeteq/:** دەنگەناو. تەقـەی زۆر و لـە سەر یەک ‹غەلبەی قسە، بـانگی منـاڵ/ تەقەتـەقی قاپی بەتاڵ «شێركۆ»› ⬛ تق‌وتوق

**تەقەڕاو / teqeřaw/:** ناو. جۆرێ ڕاو كە بە دەنـگ و هەرا نچیر دەردەپەڕێنن ⬛ شكار با سروصدا

**تەقەز / teqez/:** ئامراز. تەنانەت؛ تەنانە ⬛ حتا

**تەقەفیڕكە / teqefîřke/:** ☜ **تەقەفیڕە**

**تەقەفیڕە / teqefîře/:** ناو. تەقـەتۆرە؛ تەقەفیڕكـە؛ تەقەفێڕە؛ بەلەفیڕە؛ زگچوون ⬛ اسهال

**تەقەفێڕكە / teqefêřke/:** ☜ **تەقەفیڕە**

**تەقەفێڕە / teqefêře/:** ☜ **تەقەفیڕە**

**تەقەلا / teqela/:** ناو. هەوڵ؛ كۆشش؛ تەقالا ‹ئـەو تەقەلایـەت بـۆ دوارۆژ باشـە/ جوچـک هەوڵـێ دە، بێ‌ڕوحمە واشە «هەژار، *بۆ كوردستان*»› ⬛ سـعی؛ كوشش

▣ **تەقەلا دان:** حـەول دان؛ كۆشـش كـردن ⬛ كوشیدن

**تەقەللا / teqella/:** ☜ **تەقالا**

**تەقەلۆ** / teqelo/: ئاوەڵناو. شرەبار؛ شڕودڕپۆش ⌸ ژندەپوش

**تەقەڵ** / teqeł/: ناو. تیک؛ بەقیە؛ جۆرێ دروومان کە بەنەکەی تێدا خاڵ و خێڵ دیارە ⌸ بخیە

⊡ **تەقەڵ تێ هەڵدان:** یەک جار دەرزی لە دروومان ڕاکردن و دەرێنانەوە ⌸ بخیە زدن

**تەقەڵ دان:** ١. دووریـن؛ دوورانـن ٢. بەقیـە کردن ⌸ ١. دوختن ٢. بخیە زدن

**تەقەڵ دانەوە:** دوورینـەوەی شـتی دڕاو ⌸ بازدوختن

**تەقەڵ لێدان:** تەقەڵ تێ هەڵدان ⌸ بخیە زدن

**تەقەڵبەست** / teqełbest/: ئاوەڵناو. دادووراو؛ دادرواو؛ تێر تەقەڵ‌کراو ⌸ کاملاً بخیە خوردە

**تەقەڵترۆزی** / teqełt(i)rozî/: ناو. تڕتەقەڵ؛ تەقەڵی خراپ و درشت و خوار و خێچ ⌸ بخیەی درشت و کج و کولە

**تەقەمەنی** / teqemenî/: ناو. ماکی تەقینەوە بۆ چەکی گەرم ⌸ مهمات جنگی

**تەقەنە** / teqene/: ☜ **ئاژینە ـ١**

**تەقەوانە** / teqewane/: ناو. کونی تایبەتی کە برێ گیاندار بۆ خۆ ڕزگار کردنی دادەنێن ⌸ سوراخی کە برخی حیوانات برای فرار تعبیە می‌کنند

**تەقەوڕەقە** / teqewřeqe/: ناو. ١. شەڕ و هەرا و لێکدان ٢. دەنگ و تەق‌وپۆق ‹لە سەرمان، سەریان کیسەڵ و ڕەقە/ بردە بەر خۆیان، بێ‌تەقەوڕەقە «سەیفولقوزات»› ⌸ ١. جنگ و جدال ٢. سروصدا

**تەقیاگ** / teqyag/: ئاوەڵناو. ١. هەڵتەکاو؛ بە تەتەڵەکراو ٢. لێک‌دراو؛ بەسراو ‹دەمی بوو بە تەڵەی تەقیاگ «مەسەل»› ٣. تڕەکیو؛ تۆقیو ⌸ ١. بوجاری شدە ٢. بستە شدە ٣. ترکیدە

**تەقیان** / teqyan/: ☜ **تەقان**

**تەقیاو** / teqyaw/: ئاوەڵناو. بژارتوو؛ بژێردراو (دانەوێڵە) ⌸ پاک‌شدە (غلە و حبوبات)

**تەقیگ** / teqîg/: ☜ **تەقیو ـ١**

**تەقیلە** / teqîle/: ناو. تاقیلە؛ ئارەقچن؛ کڵاوی لە پەڕۆ و دەزوو ‹قەندیلە وا دیارە تەقیلەی سپی سەری/ یا خۆ سەرانە سەوزە کەوای، بەفرە مێزەری «حەقیقی»› ⌸ عرقچین

**تەقین** / teqîn/: چاوگ. تێنەپەڕ. //تەقیت؛ دەتەقی؛ بتەقە// تەقای: ١. تڕەکیان؛ تۆقین ٢. بەر بوونی کانی ٣. هەڵاتن ٤. تەقە کردنی جومگە ⌸ ١. ترکیدن ٢. جوشیدن چشمە ٣. فرار کردن ۴. تِق کردن مفصل

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: تەقیو/ چاوگی نەرێنی: نەتەقین

**تەقینەوە**[1] / teqînewe/: چاوگ. تەقانەوە: ١. تڕەکیان؛ تەقینی چەک و تەقەمەنی ٢. تڕەکیانەوە؛ دیسانەوە تەقین ٣. *[مەجاز]* بڵاو بوونەوەی خەبەر و باس ⌸ ١. منفجر شدن ٢. دوبارە ترکیدن ٣. پخش شدن خبر

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: تەقیوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەتەقینەوە

**تەقینەوە**[2]: ناو. کار و ڕەوتی خۆ تەقاندنەوە ⌸ عمل انتحاری

**تەقیو** / teqîw/: ئاوەڵناو. ١. تڕەکیاو؛ تۆقیو؛ تەقیگ ٢. هەڵاتوو؛ تەرە لە وڵات و مەڵبەند ⌸ ١. منفجر شدە ٢. متواری

**تەقیە** / teq(i)ye/: ناو. ١. حەیا؛ شەرم ٢. *[شیعە]* کاری شاردنەوەی بیر و بڕوا و بە ڕواڵەت هاودەنگی نیشاندان بە مەبەستی خۆ پاراستن لە مەترسی ⌸ ١. شرم ٢. تقیّە

**تەک**[1] / tek/: ناو. نانەشان؛ تەینجە؛ سەلە ⌸ آبکش

**تەک**[2]: ئاوەڵناو. ١. تاق؛ بەرامبەری جووت ٢. تاک؛ بێ‌وێنە ⌸ ١. فرد ٢. تک؛ بی مانند

⊡ **تەک کەفتن:** تەنیا مانەوە؛ جووت یان هاوچەشنان لا نەمان ⌸ تک افتادن

**تەک**[٢]: ئامراز. لەتەک: ١. لا؛ لە کن؛ لنک ‹ها تەک منا› ٢. دەگەڵ؛ لەگەڵ ‹تەک منتە؟؛ تەک تۆمە› ٣. لەگەڵی ‹تەک کێ چوو؟› ٤. بە ‹تەک کێ بێژم؟› ☰ ١. نزد ٢. با ٣. همراه؛ با ۴. به

⊡ **تەک دان:** ١. پاڵ دان بە یەکەوە ٢. لاچوون و ڕێ چۆڵ کردن ☰ ١. پشت به پشت هم دادن ٢. کنار کشیدن و راه باز کردن

**تەک دانە دواوە:** ١. بەرەو پاش کشانەوە ٢. /کینایە/ دەست لە کارێ بەردان ☰ ١. واپس رفتن ٢. پا پس کشیدن

**کەفتنە تەک:** هاوڕێ بوون لەگەڵ کەسێ یا شتێک ☰ همراه شدن

**تەکاری / tekarî/:** ناو. چارۆکە؛ کۆڵوانە ☰ رودوشی زنانه

**تەکان**[١] **/ tekan/:** چاوگ. تێنەپەڕ. //تەکای؛ دەتەکێی؛ بتەکێ// تەکین؛ تەکیان؛ تەکیای: ١. تەکاندن؛ شەکاندن ٢. تەکیان؛ شەکیانەوە ☰ ١. تکاندن ٢. تکان داده شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: تەکاو/ چاوگی نەرێنی: نەتەکان

**تەکان**[٢]: ناو. ١. کاری بزووتنی بە تەوژم ٢. پاڵ؛ بۆق ٣. /پلار/ هەوڵ و کۆشش ‹دا تویش تەکانێ بەرە خوەت!› ٤. هێز؛ قەوەت ٥. جار؛ کەڕەت ‹ئەم تەکانە تۆ بچۆ› ☰ ١. تکان ٢. هُل ٣. تلاش ۴. توان ۵. بار؛ دفعه

⊡ **تەکان بڕان:** لە تەکان کەوتن؛ تەکان نەمان؛ لە کار و جووڵە کەوتن. هەروەها: **تەکان بڕین** ☰ از حرکت افتادن

**تەکان تێکەوتن:** ١. تەکان خواردن؛ وە جووڵە کەوتن ‹دوای کاتژمێرێک، سەفەکە تەکانێکی تێکەوت› ٢. وزە و هێز گرتن ‹نانمان کە خوارد، تەکانێکمان تێکەوتەوە› ☰ ١. جنبیدن ٢. جان گرفتن

**تەکان خواردن:** ١. بزووتنەوە؛ بزووتن؛ جووڵە کردن ٢. /مەجاز/ دڵ داکەوتن ‹بەو دەنگە زلە، تەکانم خوارد› ☰ ١. تکان خوردن ٢. دل فرو ریختن

**تەکان دان:** ١. جووڵاندن ٢. ڕاوەشاندن و ڕاتڵەکاندن ٣. کەوتنە جووڵە و حەول و تەقەلا ‹بۆ تەنیا ڕۆژێ وا تەکان ئەدەن/ ئاخۆ بۆ جەژنی سەربەستی چی بکەن؟! «قانع»› ☰ ١. حرکت دادن ٢. تکان دادن ٣. به جنبش افتادن

**. تەکان**[٣]: پاشەوشە. هەڕەتی تەکاندن ‹گوێزتەکان› ☰ موسم چیدن

**تەکانتون / tekantun/:** ئاوەڵناو. تەکانتێژ؛ بەدەستوبرد؛ کارا ‹ـ داخۆم کاکت بتوانێ ئەو کارە جێبەجێ کا؟ ـ ئەرێ، تەکانتونە!› ☰ تند و تیز در انجام کار

**تەکانتێژ / tekantêj/:** ☜ **تەکانتون**

**تەکاندن / tekandin/:** چاوگ. تێپەڕ. //تەکاندت؛ دەتەکێنی؛ بتەکێنە// تەکانن: ١. ڕاوەشاندنی فەرش و بەرگ ٢. داخستنی بەری دار ‹گوێز تەکاندن› ☰ ١. تکاندن (فرش و لباس و ـ) ٢. چیدن برخی میوەها از درخت

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەتەکاندن

**تەکانن / tekanin/:** ☜ **تەکاندن**

**تەکانەوە / tekanewe/:** چاوگ. تێنەپەڕ. //تەکایەوە؛ دەتەکێیەوە؛ بتەکێوە// دوورەپەرێزی کردن؛ لێ دوور کەوتنەوە ☰ دوری جستن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: تەکاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەتەکانەوە

**تەکاو / tekaw/:** ئاوەڵناو. تەکیاگ؛ ڕاوەشێنراو ☰ تکان داده شده

**تەکبەتەک / tekbetek/:** ئاوەڵکار. هەموو؛ تێکڕا ☰ همه

**تەکبەند / tekbend/:** ناو. هەمیان؛ کەمەربەند لە

هەنبانە و جاو ☰ کمربند چرمی

**تەکخاڵ / tekxał/**: ناو. ئاس ☰ آس؛ تکخال

**تەکژی / tekjî/**: ☜ **تاکژی**

**تەککو / tekkû/**: دەنگ. تەکوو؛ وشەی سەیرمان ☰ وه

**تەککەوتو / tekkewtû/**: ئاوەڵناو. تەک‌کەوتە: ١. شوێن‌کەفتە؛ وه دواکەوتە ٢. بە تەنیا ماو ☰ ١. همراه شده ٢. تک افتاده

**تەککەوتە / tekkewte/**: ☜ **تەك‌كەوتو**

**تەکلە / tekle/**: ناو. دەرخۆنە؛ دەرخووینک؛ سەرپۆشی دەفر ☰ سرپوش ظرف

**تەکمە / tekme/**: ناو. فەرەنجی قوڵە؛ قاپووتی کورتی تا ئەژنۆ ☰ نیمتنەی نمدی

**تەکمیش / tekmîş/**: ناو. ١. بنکۆڵیی ڕەز ٢. پارازیتی ڕادیۆ و تەلەڤیزیۆن ☰ ١. عمل پی زدن و سُست کردن خاک تاکستان ٢. پارازیت رادیو و تلویزیون

**تەکنای / teknay/**: چاوگ. تەکاندن؛ ڕاوەشاندن ☰ تکاندن

**تەکوتەنیا / tek û tenya/**: ☜ **تاك و تەنیا**

**تەکودەو / tek û dew/**: ئاوەڵکار. هەڕا هەڕا ‹ڕۆژێک هەڵمەتم ئەبردە سەر کەو/ لەپڕ شمقارێک هات بە تەک‌ودەو «پیرەمێرد»› ☰ دوان ـ دوان

**تەکوەک / tekwek/**: ناو. تەکان؛ لەپت ☰ تکان

**تەکو[1] / tekû/**: ناو. ١. باقی؛ ماو لە شتێ ٢. وچان؛ پشوو ‹فرە مانی بووگین چکێ تەکوو بەین خاسە!› ☰ ١. باقیماندە ٢. استراحت

**تەکو[2]**: دەنگ. تەککوو؛ وشەی سەیرمان ☰ وه

**تەکوز / tekûz/**: ئاوەڵناو. تەکوویز؛ تەکوویس؛ ڕێک‌وپێک؛ لەبار و بێ‌کەمایەسی ☰ منظم و مرتب

**تەکوزی / tekûzî/**: ناو. ڕاستەدەمی؛ سامان؛ سەقام ☰ مرتبی

**تەکویز / tekûyz/**: ☜ **تەکوز**

**تەکویس / tekûys/**: ☜ **تەکوز**

**تەکە / teke/**: ناو. ١. ☜ **تەگە** ٢. پەڕی قوماری یەکخاڵ ٣. هاتچۆی هەڵاوەسراو ٤. لاکە ‹تەکەی سەری دێ› ٥. بزووت؛ جووڵە ☰ ١. ☜ **تەگە** ٢. آس ورق ٣. نوسان شیئ آویختە ۴. لرزش ۵. حرکت

⊡ **تەکە دان**: تەکە کردن؛ لا کەوتن و کشانەوە ☰ عقب رفتن و جا باز کردن

**تەکە کردن**: ١. ☜ **تەکە دان** ٢. بزاوتنی شتی هەڵواسراو ☰ ١. ☜ **تەکە دان** ٢. نوسان کردن جسم آویختە

**تەکەتەک / teketek/**: ئاوەڵکار. ١. لەرەلەری شتی شۆڕەوەبوو ٢. شلەشل ‹تەکەتەک کەوتە ڕێ› ☰ ١. نوسان شیئ آویختە ٢. سلانە ـ سلانە

**تەکەڵتو / tekełtû/**: ناو. نەرمەزین؛ ئارەقگیر؛ لبادی بن قایشی ئەملا و ئەولای زین ☰ برگ زین

**تەکەمە / tekeme/**: ناو. فەرەنجی؛ قاپووت ☰ پالتوی نمدی

**تەکەنمە / teken(i)me/**: ناو. تەکیمە؛ تەکینمە؛ کولاوی یەک کەسی؛ لبادی چکۆڵەی یەک کەسی ☰ نمد یک نفرە

**تەکیاگ / tekyag/**: ☜ **تەکاو**

**تەکیان / tekyan/**: چاوگ. ١. ☜ **تەکان[1]** ٢. تەکێنران ☰ ١. ☜ **تەکان[1]** ٢. تکاندە شدن

**تەکیای / tekyay/**: ☜ **تەکان[1]**

**تەکیمە / tekîme/**: ☜ **تەکەنمە**

**تەکین / tekîn/**: ☜ **تەکان[1]**

**تەکینمە / tekînme/**: ☜ **تەکەنمە**

**تەکینەوە / tekînewe/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //تەکیتەوە؛ دەتەکیتەوە؛ بتەکەوە// ١. دوور کەوتنەوە ٢. کشانەوە لە کارێ ☰ ١.دور شدن ٢. پا پس کشیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: تـەکیوەوە/ چاوگی نـەرێنی: نەتەکینەوە

**تەکیـە** / tekye/: نـاو. ١. خانـەقا؛ خانـەگا؛ دەروێشگە؛ شوێنی کۆبوونەوەی شێخ و سـۆفی و دەروێشان بۆ بەجێ هێنانی ڕێورەسمی خۆیـان ٢. خواجانە؛ سەکۆی بـەر دەرگـا ☰ ١. خانقاه ٢. سکوی جلوی در

**تەکیەگا** / tekyega/: ئاوەڵناو. پشـتیوان و یاریـدەر ☰ حامی؛ پشتیبان

**ـ تـەکێن** / -tekên/: پاشەوشـە. هـۆی تەکانـدن ‹تووتەکێن؛ گوێزتەکێن› ☰ تکان دهنده

**تەکێنران** / tekênran/: چاوگ. تەکیان؛ ڤـەتەکان ☰ تکانده شدن

**تەگبیر** / tegbîr/: ناو. تەڤبیر؛ ڕاوێژ ☰ تدبیر

**تەگبیرکەر** / tegbîrker/: ناو. ڕاوێژکار؛ ڕاوێژیـار ☰ رایزن

**تەگر** / tegir/: ☜ تەرزە

**تەگرک** / tegirk/: ☜ تەرزە

**تەگرەژیلە** / tegrejîle/: نـاو. ژیـلا؛ تـەرزە؛ تگـر ☰ تگرگ

**تەگە** / tege/: ناو. تەکە؛ تەجە؛ سابرێن؛ سـاورێن؛ نێهری؛ نێـری؛ تجەنـەڕ؛ نێرەبـزن ☰ نهـاز؛ تکـه؛ پیشرو گله

⊡ **تەگە گرتن:** ئاوس بوونی بزن لە نێری ☰ باردار شدن بُز

**بە/ وە تەگە بوون:** ئامادەی جووت بوونی بزن ☰ آماده شدن بُز برای جفتگیری

**تەگەر** / teger/: ☜ تەگەرە

**تەگـەرە** / tegere/: نـاو. تەگـەر: ١. چـەرخی عەرەبانە؛ پێچکی عەرابـە و گـاری ٢. لاسـتیک؛ تایر ٣. داری کونی بەرداشـی ژێـروو ٤. کۆسـپ؛ لەمپەر ☰ ١. چرخ ارابـه و گـاری ٢. تـایر؛ لاسـتیک چرخ ٣. چوب سوراخ سنگ آسیا ۴. مانع سر راه

⊡ **تەگەرە تێخستن:** [مەجاز] چەوت لە کار خستن؛ کۆسپ لە ڕێ دانان ☰ چوب لای چـرخ (کـاری) گذاشتن

**تەگەرە تێکەوتن:** چەوت و چەڵەمە تێ کـەوتنی کار ☰ با مانع برخوردن

**تـەل**[1] / tel/: نـاو. ١. تێـل؛ سـیم ٢. تێلگـراف؛ بەرقییە؛ برووسکە ٣. تاڵ؛ تان؛ هـەودای بلـند و باریک ‹لە گەرووی شمشاڵ لە تەلی کەمان/ گـەلێ هەڵساوە ئاوازەی جوان-جوان «گۆران»› ☰ ١. سیم ٢. تلگراف ٣. تار؛ رشته

**تەل**[2]: ☜ تاڵ[2]

**تـەلار** / telar/: نـاو. تـالار؛ تـاللار: ١. باڵـەخانە؛ ژووری قـاتی سـەرەوە ٢. هـۆڵ؛ سـالون ☰ ١. بالاخانه؛ اتاق طبقه‌ی بالای ساختمان ٢. سالن

**تەلاس** / telas/: نـاو. زێدەڕۆیی؛ زێدەکاری؛ دۆخی پێ زیاد لە ڕادە ڕاکێشان ☰ زیاده‌روی

**تەلاق** / telaq/: ناو. کار یان دۆخی شان داهێنان و پاڵ دانەوە لە سەر تەنیشت یا ئانیشک ☰ لم

**تەلان** / telan/: ناو. بەندەن؛ بەرزایی کێـو ‹لـە پـڕ خاوەن کەری زۆرزان/ هەستی کرد وا لەو دیو تەلان/ هـەراوهوریا و دەنگەدەنگـە/ ئیتـر زانی کـاری لەنگـە «پەشێو»› ☰ ستیغ کوه

**تەلانتەڕە** / telanteře/: نـاو. گیایەکە لـە بـەرزایی دەڕوێ ☰ گیاهی است

**تەلبژێر** / telb(i)jêr/: ئاوەڵناو. تەلبژێن؛ هەڵبژاردە؛ دانەبژێر ☰ برگزیده

**تەلبژێن** / telb(i)jên/: ☜ تەڵبژێر[2]

**تەلبەند** / telbend/: ناو. چیلی لە سـیم؛ تێـل بـۆ دەورە دان ☰ پرچین سیمی

**تەلپ** / telp/: ناو. تڵپ؛ سڵپ ☰ تفاله

**تەلچن** / telçin/: نـاو. تۆڕی بە تەل چنـراو ☰ تـور سیمی

**تەلحی** / telĥî/: ☜ تاڵی ـ١

**تەلدڕک / teldiřik/:** ☜ **تەلدڕوو**

**تەلدڕوو / teld(i)řû/:** ناو. تەلدڕک؛ تێلدڕوو ☰ سیم خاردار

**تەلزی / telzî/:** ناو. کەزیک؛ دەمار ☰ عصب

**تەلسز / telsiz/:** ناو. لاسلکی؛ تەلەفوونی بێتێل ‹بێ تەماشا کە لە دەشتی عیززەتا بۆ قوربی حەق/ کەی تەلیفۆن یاخۆ تەلسز کاری وەها خێرا ئەکا؟ «قانع»› ☰ بی‌سیم

**تەلسک / telisk/:** ☜ **تیسك-٣**

**تەلسماوی / telismawî/:** ناوەڵناو. سیحراوی؛ ئەفسووناوی ☰ سحرآمیز

**تەلکێشی / telkêşî/:** ناو. سیمکێشی؛ سیمکەشی ☰ سیمکشی

**تەلگی‌وبەلگی / telgî w belgî/:** ناوەڵناو. بەدبەخت؛ کلۆڵ ☰ بدبخت

**تەللان / tellan/:** ☜ **تەڕلان-١**

**تەلمسک / telmisk/:** ☜ **تیسك-٣**

**تەلمیس / telmîs/:** ناو. کوڕ و کوژی شیوەن ☰ دستەی عزاداری

**تەلوار / telwar/:** ☜ **پیرك**

**تەلواسە / telwase/:** ناوەڵناو. پەشێو؛ ئاڵۆز ☰ آشفتە

**تەلوبال / tel û bal/:** ناو. بەژن و باڵا ☰ قدوقامت

**تەلۆکە / teloke/:** ☜ **تەقڵۆکە**

**تەلووکە / telûke/:** ☜ **تالووکە**

**تەلە. / -tele/:** پێشوشە. تەختە؛ پانکەڵە ‹تەلەسەنگ› ☰ پهن و صاف

**تەلەتەل / teletel/:** ناوەلکار. ماتە ـ ماتە؛ هێدی و بێ‌چرکە؛ سەبرە ـ سەبرە ☰ پاورچین- پاورچین

**تەلەس / teles/:** ناوەڵناو. ڕەشەمەست؛ تەواو سەرخۆش ‹ئیرۆهە دەما کو بوونە پەیدا/ دینن تەلەسن جونوون و شەیدا «ئەحمەدی خانی»› ☰ پاتیل؛ مست ششدانگ

**تەلەسمباز / telesmbaz/:** ☜ **جادووگەر**

**تەلەسمە / teles(i)me/:** ناو. کرمی نۆک ☰ آفت نخود

**تەلەسەنگ / teleseng/:** ناو. تەختەبەرد ☰ تختە سنگ

**تەلەف / telef/:** ناوەڵناو. لە ناوچوو؛ خراوبوو؛ بەفیڕۆچوو ☰ تلف

**تەلەفۆن / telefon/:** ☜ **تەلەفوون**

**تەلەفوون / telefûn/:** ناو. تەلەفۆن؛ تەلەیفون؛ تەلیفون؛ تەلیفوون ☰ تلفن

**تەلەڤیزیون / televîzyun/:** ناو. وێنەگوهێز ☰ تلویزیون

**تەلەیفون / teleyfun/:** ☜ **تەلەفوون**

**تەلهە / telhe/:** ناو. تەڵە ☰ تلە

**تەلی**[1] **/ telî/:** ناو. تەڵە ☰ تلە

**تەلی**[2]**:** ناوەڵناو. تەلین؛ دروستکراو لە تەل ☰ سیمی

**تەلیزە / telîze/:** ☜ **تەلیس**

**تەلیس / telîs/:** ناو. تەلیزە؛ گۆنی؛ گوونی؛ گوونیە؛ گۆنیە؛ جەوالی تەنکی لە گووش چنراو ☰ گونی

**تەلیسم / telîsm/:** ناو. ١. دوعای جادووگەر ٢. شوێنی جادووکراو ٣. نووشتەی لە سەر زێڕ و زێو کە خشڵێکی سەر سنگە ☰ ١. طلسم ٢. طلسم شدە ٣. نوشتەی روی گردنبند طلا یا نقرە

**تەلیسماوی / telîsmawî/:** ناوەڵناو. سیحراوی؛ سەمەرە و تێکەڵ بە تەلیسم ‹کام تاسە؟ کام مەیل؟ کام چاوەنواڕی؟/ تەلیسماوییە وەک هی دڵداری؟ «گۆران»› ☰ سحرآمیز

**تەلیسە / telîse/:** ناو. سووکە بار کە لە سەرییەوە سوار دەبن ☰ بار سبک

**تەلیفون / telîfun/:** ☜ **تەلەفوون**

**تەلیفوون / telîfûn/:** ☜ **تەلەفوون**

**تەلیلە / telîle/:** ناو. تالیلە؛ وتنی «لا الە الا اللە»

به کۆمەڵ ≣ تهلیله

**تەلین / telîn/:** ئاوەڵناو. تەلی؛ دروستکراو لە تەل ≣ سیمی

**تەلێ / telê/:** ☜ **تەڵا**

**تەلێر / telêr/:** ئاوەڵناو. زگ‌زل؛ ورگن؛ دەفزگ ≣ شکم‌گنده

**تەڵ¹ / teł/:** ناو. ١. تاڵ؛ تان؛ هەودای بلند و باریک ٢. لق و پەلی درێژ و ناسک ٣. بن و ڕەگی گیا ‹تەڵی کیفۆک› ≣ ١. تار؛ رشته ٢. جوانه ٣. ریشەی گیاه

▣ **تەڵ (لێ) برین:** ١. هیچ لێ نەهێشتن؛ تەواوی شتێ خواردن ٢. لە بن برین؛ لەناو بردن ≣ ١. همه را خوردن ٢. از بین بُردن

**تەڵ ـ²:** پێشوشە. لق ‹تەڵبڕ؛ تەڵچن؛ تەڵبژێر› ≣ شاخه

**تەڵا / teła/:** ناو. زێڕ؛ زەڕ؛ تلا؛ تەلێ؛ ئاڵتوون؛ ئاتی: ١. توخمێکی کیمیاوی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ٧٩ و کێشی ئەتومی ١٩٦،٩٦ بە ڕەنگی زەردی درەوشاوە، چەکوشخۆر و دژ بە ژەنگ؛ زۆر بەنرخە و بۆ سکە لێدان، جەواهێرسازی، دەواسازی و لە دەسگاگەلی ئیلیکتریکیدا بە کار دێ ٢. هەر چەشنە بەرهەمێکی لە زێڕ دروستکراو ٣. /مەجاز/ هەر شتێکی زۆر بەنرخ ≣ ١تا٣. طلا

**تەڵاش / tełaş/:** ☜ **تۆڵاش**

**تەڵاشەبەرد / tełaşeberd/:** ناو. سەل؛ تلیشەبەرد ≣ پُلمه سنگ

**تەڵاشەدار / tełaşedar/:** ناو. قالشت؛ قاڵ؛ تەڕاش ≣ تکەی شکسته از درخت

**تەڵاق / tełaq/:** ناو. /شەرع/ کار و ڕەوتی لە یەک جیا بوونەوەی ژن و مێرد، بەپێی قانوونی شەرع ≣ طلاق

▣ **تەڵاقی سێ‌بەسێ:** /شەرع/ تەڵاقی یەکجاری ‹کەسێ دەرچوو لە داوی مەکری دنیا/ کە مەردانە تەڵاقی سێ‌بەسێ دا «ناری»› ≣ سه طلاقه

▣ **تەڵاق خستن:** /شەرع/ گوتنی دەستەواژەی «تەڵاقم کەوتبێ» وەکوو سوێندێک ≣ لفظ طلاق را بر زبان جاری کردن

**تەڵاق دران:** /شەرع/ هەڵوەشانەوەی پەیمانی ژن‌ومێردی لە لایەن پیاوەوە ≣ مُطلقه شدن

**تەڵاق کەوتن:** /شەرع/ دابین بوونی دۆخی جیا بوونەوەی ژن و شوو بە هۆی تەڵاق خستنی پیاوەوە ≣ طلاق واقع شدن

**تەڵاق نەمان:** /کینایە/ تەڵاق نەبوون؛ بێ‌ئیتوار بوونی قەسەمی پیاو ≣ بی‌اعتبار شدن سوگند مرد

**تەڵاقدراو / tełaqd(i)raw/:** ئاوەڵناو. /شەرع/ جیاوەبوو؛ بێ‌بەش‌کراو لە هاوسەر ≣ مُطلقه

**تەڵاکاری / tełakarî/:** ئاوەڵناو. تەڵاکفت؛ زێڕکفت؛ ئاوەزێڕ؛ ئاڵدوز؛ میتەڵا؛ متەڵا؛ داپۆشراو بە پەڕە یان ئاوی تەڵا ≣ زراندود

**تەڵاکفت / tełakift/:** ☜ **تەڵاکاری**

**تەڵان / tełan/:** ناو. ١. تەلان؛ سەرشان؛ سەریال ٢. هەرزاڵ؛ پێرک؛ تەبارە؛ پێرک؛ جێگەی کەل‌وپەل دانان لە ڕەشماڵدا ٣. کۆلانی باخ؛ کووچەباخ ≣ ١. ستیغ کوه ٢. جای وسایل در سیاه‌چادر ٣. کوچه‌باغ

**تەڵایی / tełayî/:** ئاوەڵناو. زێڕین: ١. زێڕن؛ دروستکراو لە زێڕ ٢. بە ڕەنگی زەردی درەوشاوە ٣. /مەجاز/ زۆر شکۆدار و پڕبایەخ ≣ ١تا٣. طلایی

**تەڵبژار / tełb(i)jar/:** ناو. تەڵبژێر؛ کاری تەلە ـ تەلە جیا کردنەوە ≣ کارِ گُلچین کردن

**تەڵبژێر¹ / tełb(i)jêr/:** ☜ **تەڵبژار**

**تەڵبژێر²:** ئاوەڵناو. تاڵچن؛ تەڵچن؛ تەڵبژێن؛ گوڵبژێر؛ هەڵبژاردە ≣ گُلچین

**تەڵبژێن / tełb(i)jên/:** ☜ **تەڵبژێر²**

**تەڵپ / telp/**: دەنگەناو. ١. تلپ؛ شڵپە؛ دەنگی دە ئاو کەوتنی شتی قورس ٢. دەنگی لە سینگ دانی ئازیەتباران ☰ تالاپ: ١. صدای در آب افتادن ٢. صدای بر سینه زدن

**تەڵچن / telçin/**: ☜ **تەڵبژێر**[٢]

**تەڵخ / telx/**: ئاوەڵناو. ١. بە ڕەنگی ڕەشی ئامال زەرد ٢. تفت؛ شیرنی ئامال تاڵ ٣. *[مەجاز]* ڕووگرژ؛ ڕووترش ☰ ١. به رنگ سیاه مایل به زرد ٢. گَس ٣. اخمو

**تەڵخەک / telxek/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* قەڵەوی ناقۆلا؛ شلەپەتە و نالەبار ☰ گُندەبَک

**تەڵدڕوو / teld(i)rû/**: ناو. ئاسندڕک؛ تێلی وارشی دڕکدار ☰ سیم خاردار

**تەڵزم / telizm/**: ☜ **تەڵەزم**

**تەڵش / telş/**: ناو. وەرەق؛ پەڕەکانزا ☰ ورق فلزی

**تەڵفیز / telfîz/**: ناو. تەڵفیس؛ گەمە و گەپ؛ گەپجاڕی؛ حەنەک ☰ شوخی؛ مزاح

**تەڵفیس / telfîs/**: ☜ **تەڵفیز**

**تەڵقین / telqîn/**: ناو. ١. ڕەوتی خستنە دڵەوە؛ هێنانە سەر باوەڕ بە شتێک لە ڕێگەی چەند پاتە کردنەوەیدا ٢. *[شەرع]* دۆعای تایبەت کە دوای ناشتن، بە سەر مردوویدا دەخوێنن ‹تەڵقینم دەکەی بە کوردی بیکە/ لێت حالی نابم زمانی دیکە «حەقیقی»› ☰ ١و٢. تلقین

**تەڵمیت / telmît/**: ناو. ١. ئەسپی کۆتەڵ ٢. ئەسپی زین و لغاوکراو بۆ کەسایەتییەکی گەورە ٣. کۆچ و بار ٤. جلێکی وەک لێفە بە سەر شان و ملی ئەسپیدا دەدەن ‹نەوای کەژاوەی لەیلێ نازانەن/ سەرەتای تەڵمیت شیرین ڕازانەن «مەولەوی»› ☰ ١. اسب مراسم عزاداری ٢. اسب زین و یراق شده ٣. کوچ ٤. عرقگیر اسب

**تەڵوەنە / telwene/**: ئاوەڵناو. شەلاڵ؛ شلتان ☰ آغشته؛ غلتان

⊡ **تەڵوەنە بوون**: خووسان ‹لە خوێن خوەیانا تەڵوەنە بوون› ☰ خیس شدن؛ آغشته شدن

**تەڵوەنە کردن**: تەڕ و تلیسک کردن ☰ خیس و آغشته کردن

**تەڵۆک / telok/**: ناو. شووڵی جەمسەری چیغی ڕەشماڵ ☰ ترکەی چیغ

**تەڵووک / telûk/**: ناو. دڕکەدزی؛ دڕوویەکی گورخە، پەرژینی پێ ساز دەکەن ☰ گونەای خار کە در ساختن پرچین به کار می برند

**تەڵووکە / telûke/**: ناو. تاڵووکە؛ لەز؛ پەلە ☰ شتاب

**تەڵە[١] / tele/**: ناو. ١. تەڵی؛ تەلهە؛ ئامرازی ڕاو لە ئاسن و تێل ٢. جۆرێ هەڵوا ☰ ١. تلەی فلزی ٢. نوعی حلوا

⊡ **تەڵەی تەقیاگ** ١. تەڵەی بەتاڵەوەکراو ٢. *[کینایە]* قسە پێنەماو ☰ ١. تلەی رها شده ٢. وامانده از جواب

⊡ **تەڵە کردن**: هەڵچەقینی بەرد لە بنی پێی یەکسم لە کونی نالەکەیەوە ☰ فرورفتن سنگریزه از سوراخ نعل در پای اسب و الاغ

**تەڵە نانەوە** ١. داو دانان ٢. *[مەجاز]* پیلان گێڕان؛ گزی کردن بۆ فریودان ☰ ١. دام نهادن ٢. توطئه کردن

**بوونە تەڵەوە** ١. تووشی تەڵە هاتن ٢. *[کینایە]* ڕووگیر بوون ☰ ١. در تله افتادن ٢. در رودربایستی افتادن

**دەم بوونە تەڵەی تەقیاگ** قسە پێنەمان و حەپەسان و دەم داچەقان ‹هەر وامە وت، دەمی بووە تەڵەی تەقیاگ› ☰ حرفی برای گفتن نداشتن

**تەڵە-[٢]**: پێشوشە. تەڵە ـ تەختە ـ ؛ پانکەڵە ‹تەڵەبەرد› ☰ پهن و صاف

**تەڵەب / teleb/**: ناو. تەڵەو: ١. داوا؛ ویست ٢. نێرخوازیی ماکەر ‹ماکەرەکە بە تەڵەبە› ☰ ١.

درخواست؛ طلب ٢. گُشن خواهی ماده الاغ

**تەڵەباو / telebaw/:** ناو. قوڕ و لیتەی بەجێماو لە سێلاو 🇮🇷 گل و لای جامانده از سیل

**تەڵەبەرد / teleberd/:** ناو. پارچەیەکی درێژ و پانکەڵە لە بەرد 🇮🇷 تختەسنگ

**تەڵەبە / telebe/:** ناو. فەقێ 🇮🇷 طلبه

**تەڵەبەیی / telebeyî/:** ناو. فەقێیەتی؛ فەقێتی 🇮🇷 طلبگی

**تەڵەپا / telepa/:** ناو. لەتر؛ ڕەت 🇮🇷 تلو

**تەڵەتەقێن / teleteqên/:** ئاوەڵناو. [کینایە] فێڵباز و خاپینۆک 🇮🇷 فریبکار

**تەڵەڕێوی / telerêwî/:** ناو. تەڵەوڕێوی؛ گاڵتەیەکە 🇮🇷 از بازی‌ها

**تەڵەزم / telezim/:** ناو. تلیزم؛ تەڵزم؛ پارچەی تەنک لە دار یان بەرد 🇮🇷 تراشەی چوب یا سنگ

**تەڵەکە / teleke/:** ناو. گەڕ؛ گزی؛ حیلە 🇮🇷 تلکه

**تەڵەکەباز / telekebaz/:** ئاوەڵناو. فێڵباز؛ گزیکار 🇮🇷 حیله‌گر

**تەڵەکەبازی / telekarî/:** ناو. لابان؛ فێڵ؛ گەڕ و گزی 🇮🇷 نیرنگ

**تەڵەگا / telega/:** ناو. داوگە؛ جێداو؛ جێتەڵە 🇮🇷 دامگاه

**تەڵەگورگ / telegurg/:** ناو. تەڵەی تایبەت بۆ گورگ گرتن 🇮🇷 تلەی گرگ

**تەڵەمار / telemar/:** ناو. گیای مەرگەمار 🇮🇷 کَبَر

**تەڵەمشک / telemişk/:** ناو. تەڵەمڵە؛ تەڵەی تایبەتی مشک گرتن 🇮🇷 تلەموش

**تەڵەمڵە / telem(i)le/:** ☜ **تەڵەمشك**

**تەڵەمە / teleme/:** ناو. چەڵەمە؛ ئێسکی چۆڵەمە 🇮🇷 جناغ

**تەڵەمەشکێنە / telemeş(i)kêne/:** ناو. چۆڵەمەشکێنە؛ چەڵەمەشکێنە 🇮🇷 عمل جناغ شکستن

**تەڵەو / telew/:** ☜ **تەڵەب**

**تەڵەوڕێوی / telewřêwî/:** ☜ **تەڵەڕێوی**

**تەم / tem/:** ناو. ١. مژ؛ دومان ‹تا نەگریا ئاسمان و تەم ولاتی دانەگرت/ گوڵ چەمەنئارا نەبوو، هەم لێوی غونچە وا نەبوو «نالی»› ٢. تۆز و غومار ٣. تاریکایی بەر چاو ٤. کاری مژدان لە جگەرە و قلیان و ... ٥. کاری لێو لێکتوند کردن بۆ هەڵمژینی تراو ٦. [مەجاز] خەم و کەسەر 🇮🇷 ١. مه ٢. غُبار ٣. تاری چشم ۴. پُک (به سیگار و ...) ۵. مُک ۶. غم و غصه

⊡ **تەم بەرچاو گرتن:** لە بەر تووڕە بوونی زۆر، هیچ نەدیتن 🇮🇷 تار شدن دید از شدت عصبانیّت

**تەم داگرتن:** خەفەت سواری سەر بوون 🇮🇷 غرق اندوه شدن

**تەما / tema/:** ناو. ١. هیواداری؛ چاوەنواڕی ٢. نیاز و لێبڕان ٣. تەماح؛ چاوچنۆکی 🇮🇷 ١. چشمداشت ٢. تصمیم ٣. آز؛ طمع

⊡ **تەما بون:** ویستن؛ خواستن؛ گەرەک بوون ‹لە دلڕقییەکەت تەماتە ڕەو کەم؟ «فولکلۆر»› 🇮🇷 قصد داشتن

**بە تەما بون:** ١. گەرەک بوون؛ ویستن ٢. چاوەڕێ بوون ‹من هەر دلسۆزم دوژمن بە کەس نیم/ بۆ خزمەت نەبێ من بە تەمای چیم «موفتی پێنجوێنی»› 🇮🇷 ١. قصد داشتن؛ خواستن ٢. انتظار داشتن

**تەماتم / tematim/:** ناو. هەڵەی زمان لە تووڕەیی 🇮🇷 تپق در اثر خشم

**تەماتە / temate/:** ناو. تۆماتێز؛ تەمەتە؛ تەماتێ؛ باینجان؛ باینجانە سوورە؛ باجاناسوور؛ باجاناسۆر؛ باجانسۆر؛ باژاناسۆر؛ بایجانی سوور؛ باینجان فەرەنگی: ١. گیایەکی ئالیکی بە گەڵای بڕگەبڕگە و گوڵی تاکی مەیلەو سەوزەوە ٢. بەری خڕ، سوور، گۆشتنی ئەو گیایە کە خواردنێکی زۆر باوە 🇮🇷 ١و٢. گوجه‌فرنگی

**تەماتەجنانی / tematec(i)nanî/:** ناو. گیایەکی

گەلاپانە و بەرەکەی لە تەماتە دەکا، بەلام وردترە ☰ عروسک پس‌پردە

**تەماتـەجنانێ** / tematec(i)nanê/: نـاو. کـاکنج؛ کاکنەج ☰ کاکنج

**تەماتەسیاوێ** / temates(i)yawê/: ناو. باینجـان؛ باجان؛ بامجان ☰ بادنجان

**تەماتەمارانە** / tematemarane/: ناو. مێوەمارانـە ☰ انگور مار

**تەماتەمرۆژە** / tematem(i)roje/: ☜ **ترێمارانە**

**تەماتێ** / tematê/: ☜ **تەماتە**

**تەماح** / temaĥ/: ناو. چاوچنۆکی؛ چاونـەزێری ☰ آز؛ طمع

⊡ **تەماح تێکردن:** کەوتنە تەمای شتێکەوە ☰ بـە طمع چیزی افتادن

**تەماح کردن:** کەوتنە تەماوە ☰ طمع کردن

**تـەماحکار** / temaĥkar/: نـاو. بەتـەماح؛ تمـا؛ هەفهەفی ☰ طمعکار

**تەمادار** / temadar/: ناوەلناو. بەهومێد ☰ امیدوار

**تـەماداری** / temadarî/: نـاو. هومێـدەواری ☰ امیدواری

**تەمار** / temar/: ناو. ۱. شارەگ؛ شـادەمار؛ دەمـار ۲. ڕەشایی بەرچاو ☰ ۱. شاهرگ ۲. تاری دید

**تەمارتن** / temartin/: ☜ **تەمراندن**

**تەمارزوو** / temarzû/: ☜ **تامەزرۆ**

**تەماشا** / temaşa/: ناو. تاشا؛ تماشا؛ تواشا؛ تەواشا؛ کاری ڕوانین؛ چاو لێکردن؛ نۆڕین؛ مـەیزە کـرن ‹ناستەنش هەوای نەوبەهاران پێم/ تەماشـای وەهـار حالەتەکەی وێم «مەولەوی»› ☰ تماشا

**تەماشاچی** / temaşaçî/: ناو. تماشاچی؛ تواشاچی؛ سەیرکەر ☰ تماشاچی

**تەماشـاخانە** / temaşaxane/: نـاو. تواشـاخانە؛ تماشـاخانە؛ تەواشـاخانە؛ جێگایـەک (زۆرتـر بـە شێوەی مالێک بە دەمودەزگای تایبەتەوە) بۆ بەرێوە بردن و پیشاندانی شانۆ لە بەر چاوی بینـەران ☰ تماشاخانە

**تەماکار** / temakar/: ناوەلـناو. بەتـەماح؛ چاونـەزێر ☰ آزمند

**تەماکاری** / temakarî/: ناو. چنۆکی ☰ آزمندی

**تەماکۆ** / temako/: ناو. تووتن ☰ تنباکو

**تەماکۆجنانـە** / temakoc(i)nane/: نـاو. گۆشـەن وەنا، کە بۆ لابردنی بەردی مسولدان بەسوودە ☰ تنباکوی کوهی

**تـەمال** / temał/: ناو. کاری دۆزینەوەی کەروێشک لە لاندا ☰ عمل یافتن خرگوش در کُنام

**تەمام** / temam/: ناوەلکار. هەموو؛ تێکڕا ☰ همە

**تەمامنای** / temamnay/: چاوگ. تـەواو کـردن ☰ بە انجام رساندن

**تەمامی** / temamî/: ناوەلکار. هەمووکی؛ بێ کـەم و کووڕی ☰ بە تمامی

**تەمامیای** / temamyay/: چاوگ. تەواو بوون ☰ بە انجام رسیدن

**تەماوی** / temawî/: ناوەلـناو. تەمبار؛ تەمنیشتوو ☰ مەآلود

**تەمایار** / temayar/: ☜ **تەمایەر**

**تەمایر** / temayir/: ☜ **تەمایەر**

**تەمایـەر** / temayer/: ناوەلـناو. تـەمایار؛ تـەمایر؛ تەوادار: ۱. چـاوەڕوان ‹چارەنووسـت خـۆت ئـەبێ دیـاری بکـەی/ نـەک تەمایـەر بی کـە بـۆت کـەن هەندەران «قانع»› ۲. بەهیوا؛ هیوادار ☰ ۱. منتظر؛ چشم‌انتظار ۲. امیدوار

**تەمایەری** / temayerî/: ☜ **ماتلی**

**تەمبار**[1] / tembar/: ناو. تەپە ☰ تپە

**تەمبار**[2]: ناوەلناو. تەمنیشتوو؛ تەماوی ☰ مەآلود

**تەمباسک** / tembask/: ناو. گرد؛ تەپۆلکە ☰ تپـەی کوچک

**تـەمباف** / tembav/: ناو. ۱. نەغمەی ژێر عـەرز ۲.

گێژاو ٣. چاڵی بەردین لە ناو شاخ و چیادا ☰ ١. نقب ٢. گرداب ٣. گودال سنگی در کوه

**تەمبور / tembûr/:** ناو. تەموورە؛ تەمیرە؛ تەنبوور؛ سازێکی چوار سیمی کاسە گەورەی وەک هەرمێیە، دەستەیەکی درێژی هەیە بە قامکان دەیژەنن ☰ تنبور

**تەمبورژەن / tembûrjen/:** ناو. تەمبوورڤان؛ تەنبوورلێدەر ☰ تنبورنواز

**تەمبورڤان / tembûrvan/:** ☜ تەمبورژەن

**تەمبورە / tembûre/:** ناو. تەموورە؛ تەموورکە؛ پیک؛ زەنبوورە؛ زەمبوورەی ئاش ☰ سوراخ تنگ ناو آسیاب

**تەمبەڵ[1] / tembeł/:** ناو. کۆڵەکەیەک کە دەخرێتە بن دیوار، کاریتە ڕادەگرێ ☰ ستونی کە دیرک را نگه می‌دارد

**تەمبەڵ[2]:** ☜ تەمەڵ

**تەمبەڵخانە / tembełxane/:** ناو. فەقیرخانە ☰ نوانخانه

**تەمبەڵیت / tembełît/:** ☜ تەمەڵیت

**تەمتومان / temtûman/:** ناو. تەم و مژ ☰ مه و غبار

**تەمتەراق / temteraq/:** ناو. دەبدەبە؛ شکۆ؛ جەلال ☰ طمطراق؛ دبدبه

**تەمتەم / temtem/:** ناو. تەمتەمان؛ ڕەقەن؛ زەوینێ بنەکەی نەرمان نەبێت ☰ زمین سنگی

**تەمتەمان / temteman/:** ☜ تەمتەم

**تەمتەمە / temteme/:** ناو. تمتمه؛ نووکی مزرەق؛ نووک گیزگیزە ☰ نوک آهنین گردنا

**تەمتێل / temtêl/:** ناو. *[پلار]* تمتیل؛ تمتێل؛ سەر و پۆتراک ‹بەلا لەی تەمتێلەت وارێ!› ☰ سر و سیما

**تەمخە / temxe/:** ☜ تەغمە

**تەمدار / temdar/:** ناو. دارتەون ☰ دار قالی

**تەمر / temr/:** ناو. پارچە قاقەزێکی چاپکراوی چکۆلە بە نرخێکی تایبەتەوە کە لە بەرانبەر خزمەتێکەوە، دەوڵەت لە خەڵکی دەستێنێ ☰ تمبر

⊡ **تەمر کردن:** جواب کردن؛ جواو دان ☰ تمبر کردن

**تەمران / temran/:** چاوگ. ١. داپۆشران؛ داپۆشیان ٢. کوزرانەوە؛ کوژیانەوە ☰ ١. پوشیده شدن ٢. فرونشستن آتش

**تەمراندن / temrandin/:** چاوگ. تەمارتن؛ تەمرین: ١. داپۆشین لە خاک ٢. کوژاندنەوەی ئاگر ☰ ١. زیر خاک نهادن ٢. فرونشاندن آتش

**تەمری / temrî/:** ئاوەڵناو. کوژاوە؛ دامرکاو ☰ خاموش‌شده

**تەمرین / temrîn/:** ☜ تەمراندن

**تەمژی / temjî/:** ناو. ساویر؛ گومان؛ خەیالات ☰ توهم

**تەمساڵ / temsał/:** ئاوەڵناو. تەوەزەل؛ تەنبەڵ؛ تەمەڵ ☰ تنبل

**تەمسق / temsiq/:** ناو. باسوق؛ باسوخ ☰ باسلُق

**تەمشوێ / temş(i)wê/:** ☜ تەشوێ

**تەمشو / temşû/:** ☜ تەشوێ

**تەمغە / temğe/:** ناو. مۆری دەزگای دەوڵەتی ☰ مُهر اداری

**تەمنای / temnay/:** چاوگ. کردنە تەم ☰ مه‌آلود شدن

**تەمنیشتو / temnîştû/:** ☜ تەمبار[2]

**تەمومژ / tem û mij/:** ناو. مژ و دوومان ☰ مه و غبار

**تەمۆری / temorî/:** ناو. کاکۆل؛ قژی چەپک‌کراو ☰ گیسوی دسته شده

**تەموو / temû/:** ناو. ١. تۆپی ئاش؛ جێگەی پەڕەی ئاش ٢. خالیە؛ خالیگە ☰ ١. جای پرّەی آسیاب ٢.

تُهیگاه

**تەمووخ / temûx/**: ناو. سـندەڕەمل؛ ڕەملـی لێکهاڵاو ☰ ماسەی کلوخ شده

**تەموورکە / temûrke/**: ☜ تەمبوورە

⊡ **تەموورکە دان**: ☜ **تەموورە دان**

**تەموورە / temûre/**: ناو. ١. ☜ **تەمبـوورە** ٢. ☜ **تەمبوور** ٣. ئابلـۆقە؛ دۆخـی دەورە دان ☰ ١. ☜ **تەمبورە** ٢. ☜ **تەمبوور** ٣. حالت حلقە زدن

⊡ **تەموورە بەستن**: ☜ **تەموورە دان**

**تەموورە دان**: تەموورکـە دان؛ تـەموورە بەسـتن؛ ئاپۆڕە دان؛ لە دەوری یەک یا شتێ کۆ بوونەوە و سەر کردنە ناو یەکدا ☰ حلقە زدن

**تەمووز / temûz/**: نـاو. مـانگی حەوتـەمی سالـی ڕۆمی، بەرانبەر بە جوولای ☰ ماە تَموز

**تەمووشە / temûşe/**: ناو. زاخـە؛ زاخـڕ؛ زاخـۆن ☰ زاغە

**تەمووی / temûy/**: ئامراز. قەو؛ قـەد ‹دایـە تـەمووی دارەکا› ☰ بر روی؛ بر تنِ

**تەمەت / temet/**: ئامراز. بە ئەندازەی؛ بە قەد ☰ بە اندازەی

**تەمەتە / temete/**: ☜ **تماتە**

**تەمەر / temer/**: ☜ **تۆبە**

**تەمەرە / temere/**: ناو. بەڵا و کێشە و گێرە ☰ بلا؛ گرفتاری

**تەمەرێز / temerêz/**: ناو. ١. شەڕەکەڵ ٢. *[کینایە]* گرمە و گوڕە؛ قەرمبالغ؛ شەڕ و هەڵا ‹شێت بگەیتە شێت، تەمـەرێز هـەی تەمـەرێز! «مەسـەل»› ☰ ١. جنگ کَل (گوزن) ٢. شلوغی

**تەمەز / temez/**: ☜ **تمەز**

**تەمەزی / temezî/**: نـاو. تەمەسـی؛ دەسـرەی ئاوریشـم؛ دەسماڵـی هـەورمێش ☰ دسـتمال ابریشمی

**تەمەسی / temesî/**: ☜ **تەمەزی**

**تەمەڵ / temel/**: ناو. هەڵماتی مەڕـ مەڕ ☰ تیلە

**تەمەلوول / temelûl/**: ناو. پەژارە ‹دیسان سەر لە نۆ ماڵوێرانیمە/ تەم و تەمەلوول سەرگەردانیمە «قانع»› ☰ اندوە؛ تألم

**تەمەڵ / temeł/**: ئاوەڵناو. تەمبەڵ؛ تەنبـەڵ؛ تـەپ؛ کـەهاڵ؛ کـاهێل؛ سەقەڵـوو؛ زەمتـە؛ هـەمین؛ لـەش‌گـران؛ سـەرگران؛ بـارگران؛ سـەرقورس؛ خەرمەک؛ زمنگۆڵ؛ تەمسـاڵ؛ ساپاوس؛ پـاوس؛ گاپاوس؛ دیلم؛ دیلەم؛ دولـەم؛ ژەڵـموو؛ تووسـە؛ کەلپێ؛ تلنگن؛ لەش‌لەمل؛ شـەولەش؛ تڕتـەپاڵ؛ لەش‌قورس؛ شەختۆ؛ مێشـگر؛ مێشـگرە؛ سڵـپ؛ تەپلۆس؛ تەپلمۆس؛ تـەوەزەل؛ تـڕەک؛ دێـزەک؛ بێکارە؛ تەڕاڵ؛ پالۆ؛ ماتوڕا؛ کارنەکەر؛ فل؛ لەمتەز؛ قوونگران؛ قوونقورس؛ بێزار و وەڕەز لە کار و بار ‹شاگردی تەمەڵ› ☰ تنبل

**تەمەڵخانە / temełxane/**: ناو. جێ ژیانی ئەوانەی کاریان پێ‌ناکرێ ☰ نوانخانە

**تەمەڵە / temełe/**: نـاو. بنـەڕەت؛ بـەردی بناغـە؛ هەوەڵ ڕیزی هیم ☰ زیربنا

**تەمەڵی / temełî/**: نـاو. تەنبەڵـی؛ لـەش‌گـرانی؛ تەپی؛ تەوەزەلی ☰ تنبلی

**تەمەڵیت / temełît/**: ناو. تەمبەڵیت: ١. پاشـکۆی پێچراوی دوای زین ٢. تەمەڵە؛ بەردی بناغـە ٣. سەربار؛ بارێکی چووک کە لە سەر باری دادەنـێن ☰ ١. بقچەی بە فتراک بستە شدە ٢. بُنیان ساختمان ٣. اضافە بار

**تەمەن / temen/**: نـاو. ئامـان؛ عـومر؛ عـەمر: ١. ژمـارەی سـاڵانی ژیـانی گیانـدارێک بەتایبـەت مرۆڤ ٢. ماوەی ژیان ☰ ١. سن ٢. عُمر

⊡ **تەمەنی ژیری**: ڕێـژەی لێهـاتوویی هـزری هـەر کەسێک لە چاو تەمەنی ☰ سن عقلی

**تەمەنی قانوونی**: تەمەنی ڕووتێکـردنی ئـەرک و مافی تایبەتی هـەر کەسـێکی پێگەیشـتوو لـە

کۆمەڵدا سن قانونی

**تەمەنا** / temena/: ناو. ١. کار و ڕەوتی چەست کێشانی سەرباز بۆ ئەفسەر ٢. تکا و ڕەجا ١. عمل احترام گذاشتن برای مافوق ٢. تمنّا

**تەمەندرێژ** / temend(i)rêj/: ئاوەڵناو. عومردرێژ؛ خاوەن ژیانێکی زۆر سالمند

**تەمەنکورت** / temenkurt/: ئاوەڵناو. بێبەش لە ژیانێکی زۆر کم عُمر

**تەمیان** / temyan/: ناو. خەمگینی؛ خەفەتباری اندوه

**تەمیای** / temyay/: چاوگ. ١. بوونە تەم ٢. داتەمین؛ خەم داگرتن ١. مه‌آلود شدن ٢. افسُردن

**تەمیرە** / temîre/: ☜ تەمبور

**تەمیز** / temîz/: ☜ تەمیس

**تەمیس** / temîs/: ئاوەڵناو. تەمیز: ١. پاک و خاوێن ٢. *[مەجاز]* تەواو؛ بێ‌کەموکووڕی ٣. *[مەجاز]* ڕێکوپێک ١. تمیز ٢. بی‌نقص ٣. مُنظم

**تەمیسی** / temîsî/: ناو. پاکە؛ پاکی؛ خاوێنی زاغه

**تەمین** / temîn/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* تەماوی؛ خەمبار؛ دڵتەنگ ‹هۆرمەگێرۆ ئاو بە دیدەی تەمین/ مەوارۆ بە ئاو وە ڕووی سەرزەمین «بێسارانی»› اندوهگین

**تەمینە** / temîne/: ناو. شەستەباران باران تُند

**تەمێ** / temê/: ناو. گوێچەڕ؛ کاری ژێر کردن؛ ئەدەب کردن؛ جۆرێک سزادان بە مەبەستی ئاگادار کردنەوە لە ئاکاری نادروست تنبیه

▣ **تەمێ بوون** ژێر بوون؛ پەند وەرگرتن لە سزا دینەوە و دەست لە کاری ناڕەوا هەڵگرتن تنبیه شدن

**تەمێ کردن** ١. سزادان لە سەر هەڵە و تاوان ٢. ڕاسپاردن ١. تنبیه کردن ٢. سفارش کردن

**تەمێخۆر** / temêxor/: ئاوەڵناو. جزیادیتوو؛ جزیادراو کیفردیده

**تەن** / ten/: ناو. ١. لەش؛ جەستە؛ لاشە؛ کەلەستە؛ کەلەخ؛ پەیکەر؛ گەت؛ گۆڤدە؛ بەدەن؛ قالب؛ کەلەستەی ماکی ژینەوەر، بەتایبەت مرۆڤ و باقی گیانەوەران ‹تەنی ڕازی بە خەشین‌پۆشیی وەکوو شێر و شوتور/ بێ‌نیازە لە برێشم تەنی و پیلەتەنی «نالی»› ٢. ماک؛ ئەوەی بارستا و قورسایی هەبێ و جێگایەک بگرێتەوە ‹تەنی بەستوو› ٣. سیان؛ قورم ٤. تۆن؛ هەزار کیلۆ ١. تن؛ کالبد؛ بدن ٢. جسم ٣. دوده ٤. تُن

▣ **تەنی ئاسمانی** هەر ماکێکی ئاسمانی کە ببینرێت (وەک خۆر، مانگ و ئەستێرەکان) جِرم آسمانی

**تەنا** / tena/: ئاوەڵناو. ١. ئاسوودە؛ ڕەحەت ‹خەوێکی ئارام و تەنا› ٢. تەنیا؛ تاقی تەنێ ١. آسوده ٢. تنها

**تەناباز** / tenabaz/: ☜ تەنافباز

**تەنابازی** / tenabazî/: ☜ تەنافبازی

**تەناف** / tenaf/: ناو. شریت؛ کەبەند؛ ڕێسراوێکی قایم لە ماکێکی نەرم تناب

**تەنافباز** / tenafbaz/: ناو. تەناباز؛ بەنباز؛ پەلهەوان؛ ئەو هونەرمەندەی بە سەر گوریسی ڕایەڵ‌کراودا دەڕوا و هەڵدەبەزێ بندباز

**تەنافبازی** / tenafbazî/: ناو. تەنابازی؛ بەنبازی؛ کاری بە سەر تەنافدا ڕۆیشتن و هەڵبەزین بندبازی

**تەنافپێچ** / tenafpêç/: ناو. چۆلەپێچ؛ گولۆلەپێچ طناب‌پیچ

**تەنانە** / tenane/: ☜ تەنانەت

**تەنانەت** / tenanet/: ئامراز. تەنانە؛ حەتتا: ١. زیاتر لەوە ‹تەنانەت خاچی گەردنبەند، «الله»یەکیان لێ هەڵدەکەند «هەژار، *چوار ئاملکە*»› ٢. لە سەرینەی ئەوانی دیکە ‹تەنانەت تۆش بەجێت‌هێشتم!› ٣.

وشـەی پێـداگری ‹نـەک هـەر سـلاویکی نـەکرد تەنانەت وەبەر جنێویشی داین!› ■ ١تا ٣. حتّی

**تەنانەتی / tenanetî**: ئاوەڵناو. تایبـەت؛ تایبـەتی ‹شتێکی تەنانەتییە› ■ ویژە؛ مخصوص

**تەناو / tenaw**: ☜ تەنراو

**تەناهی / tenahî**: ناو. تەنایی: ١. ئاسـوودەیی ٢. سـوکنایی؛ خۆشـی و ئـارامی ■ ١. آسـودگی ٢. آرامش

**تەنای / tenay**: ☜ تەنین

**تەنایی / tenayî**: ☜ تەناهی

**تەنبـو / tenbû**: نـاو. ١. تۆپیـو؛ کـەوتی؛ مردارەوەبوو ٢. گەنە ٣. تۆپی ئاش ■ ١. مُردار ٢. کنه ٣. مرکز پرەهای آسیا

**تەنبور / tenbûr**: ☜ تەمبور

**تەنبوری / tenbûrî**: ناو. کاکۆڵی پیاوانە ■ کاکُل

**تەنبەتەن / tenbeten**: ئاوەڵناو. تایبەتمەنـدی شەڕی دوو کەس یا دوو لایەن پێکەوە ■ تن‌بەتن

**تەنبەکی / tenbekî**: ناو. تەماکۆ؛ تووتنی نێرگەلـە ■ تنباکو

**تەنبەڵ / tenbeł**: ☜ تەمەڵ

**تەنبەڵە / tenbełe**: ناو. تەمەڵە؛ بەردی بناغە ■ بنیان ساختمان

**تەنبەڵی / tenbełî**: ☜ تەمەڵی

**تەنپەروەر / tenperwer**: ئاوەڵناو. دەسـتوپـێ سپی؛ خۆ خۆشەویست ■ تن‌پرور

**تەنتەڵ / tenteł**: ناو. مۆتەکە؛ مێردەزمە؛ حاڵەتی سنگ سوار بوون ■ کابوس

**تەنتەنە / tentene**: ناو. ١. بزەمبزەم؛ سەنسـەنە؛ جـەلال و شـکۆ ‹چییـە ئـەم هـەموو تەنتەنـە و مـن‌منـت؟/ ئەمەنـدە چییـە فـەخر و بـەخ کردنـت؟ «مەحوی»› ٢. خشـڵ؛ خشـروخاڵ ٣. پووڵـەکە؛ ئۆییە ■ ١. جلال و شکوه ٢. زیورآلات ٣. پولک زینتی

**تەنخوا / tenx(i)wa**: نـاو. ١. کووتـاڵ و ماڵـی بازرگـانی ٢. دەسمایـە؛ سـەرمیان ■ ١. کـالای بازرگانی ٢. سرمایه

**تەنخوای / tenx(i)way**: ئامراز. بـاتی؛ لـە بـاتی؛ جیاتی ‹موبارەکت بـۆ بـەزم نـۆ وە خـەیر/ تـۆ خـوا تەنخوای من خاس خاس بکەر سەیر «مەولەوی»› ■ به جای

**تەندران / tend(i)ran**: ☜ تەنران

**تەندراو / tend(i)raw**: ☜ تەنراو

**تەندروست / tend(i)rust**: ئاوەڵناو. تەنـدرووس؛ ساغ؛ ساق؛ سەلامەت ■ تندرست

**تەندروستی / tend(i)rustî**: نـاو. ١. سـاخی و سـلامەتی ‹وەرزش بـۆ تەندروسـتی پێویسـتە› ٢. باری ساخی و سـلامەتی ‹تەندروستییەکی باشـی هەیە› ■ ١و٢. تندرستی

**تەندرووس / tend(i)rûs**: ☜ تەندروست

**تەندور / tendur**: ☜ تەنور

**تەندوور / tendûr**: ناو. تەنـدور؛ تـەنوور ‹هـەرگیز مەهێڵە دامرێ تەندوورەکەت لە گڕ/ بەو تینی گەرمی وی، دلی دوژمن دەبێ توێ «ئاوات»› ■ تنور

**تەندووراو / tendûraw**: ناو. گێژاو ■ گرداب

**تەندووڕپلاوی / tendûrp(i)ławî**: نـاو. پـلاو لـە پەرش ■ بلغور دم‌کرده

**تەندوورە / tendûre**: ناو. ١. ئـەو حەوزۆکـەی لـە قسڵ و بەرد ئەیکەن و ئاوی ئاشی تێ دەرژێ ٢. گرمە و هاڕە ٣. گێژەڵووکە ٤. گێجاو ‹جۆشـش و تابـە لـە نێـو دیـدەیی گریانمـدا/ چ تەنوورێکـە لـە تەندوورەیی تۆفانمدا «نالی»› ٥. پۆل و شەپۆلێ لە با، ئاو یا شتی تر کە بە کۆمـەڵ هەڵدەسـووڕێ و لوول دەخـوا و بـان و خـوار دەکـا ■ ١. تنـورەی آسیاب ٢. غُرّش ٣. گردباد ۴. گرداب ۵. تنوره

**تەندوورەزەنە / tendûrezene**: نـاو. کـار و ڕەوتی لێکهاڵان و سەرکەوتنی دووکەڵ و تەپوتـۆز ■

بە هم پیچیدن و بلند شدن گرد و خاک و دود

**تەندورەژەنە / tendûrejene/**: ناو. گێژاو؛ گەرداو؛ گەرداف ☰ گرداب

**تەنران / tenran/**: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //تەنرای؛ دەتەنرێی؛ بتەنرێ// تنران؛ تەندران؛ چنران ☰ تنیده شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: تەنراو/ چاوگی نەرێنی: نەتەنران

**تەنراو / tenraw/**: ئاوەڵناو. تەناو؛ چنراو؛ تەندراو؛ تەنیاگ ☰ تنیده؛ بافته

**تەنراوە / tenrawe/**: ناو. سەردڕ؛ کر ☰ بافته

**تەنزیف / tenzîf/**: ☜ تامپون

**تەنزیل / tenzîl/**: ناو. پارچەی سپی و تەنک ☰ تنزیل؛ پارچەی سفید درشتباف

**تەنشت[1] / tenişt/**: ناو. ١. لا؛ نک؛ ئاتەک ٢. خالیگە ☰ ١. طرف؛ سوی ٢. تُهیگاه

**تەنشت[2]**: ئامراز. لای؛ لاو؛ پالی؛ ڕووی ☰ مجاورتِ؛ جنبِ

▣ **لە تەنشت**: لە پالی؛ لە لای ☰ در کنارِ

**تەنشتاوتەنشت / teniştawtenişt/**: ئاوەڵکار. لە سەر لا؛ لاولا ☰ لابەلا

**تەنشدەر / tenişder/**: ناو. لاشەپیانە؛ دوو لای ئەستوونی چوارچێوەی درگا ☰ دو طرف عمودی چهارچوبەی در

**تەنک / tenik/**: ئاوەڵناو. ١. پانی ناسک ٢. نە قووڵ ٣. شاش؛ نە پڕ ٤. دوورــ دوور ‹باخچەکەمان تەنکە› ☰ ١. تُنُک ٢. کمعمق ٣. کمپشت ٤. با فاصله

**تەنکاو / tenkaw/**: ناو. ئاوێ کە قووڵ نەبێ ‹نامانە مل چەم سوار لە شوێن سوار/ شلپ و هووڕ کەوتە ناو تەنکاوی بوار «گۆران»› ☰ آب کمعمق

**تەنکوتیواڵ / ten(i)k û tîwał/**: ☜ تەنکوتیوڵ

**تەنکوتیوڵ / ten(i)k û tîwił/**: ئاوەڵناو. تەنکوتیواڵ؛ زۆر ناسک و تەنک ☰ بسیار نازک و تُنُک

**تەنکۆڵ / tenkoł/**: ئاوەڵناو. تەنکۆڵە؛ تەنکەڵە؛ ناسک و تەنک ☰ نازک و نامتراکم

**تەنکۆڵە / tenkołe/**: ☜ تەنکۆڵ

**تەنکۆڵی / tenkołî/**: ☜ تویکاری

**تەنکە / tenke/**: ئاوەڵناو. شەنگ؛ بەرز و باریک ☰ رعنا

▣ **تەنکە کردن**: ١. هەڵکێشان و سووک کردنی چاندراوی پڕ ٢. بلاوە کردن؛ کەم بوونەوە و بلاو بوونەوەی ئاپۆرەی حەشامات ‹خەڵکەکە تەنکەیان کرد› ☰ ١. تُنُک کردن کشت مُتراکم ٢. پراکندە شدن

**تەنکەبەدۆ / tenkebedo/**: ناو. دۆیێ کە لە تۆراغی وشک سازی دەکەن ☰ دوغ کشک

**تەنکەڵە / tenkełe/**: ☜ تەنکۆڵ

**تەنگ[1] / teng/**: ناو. ١. کەمەربەندی بارەبەر ٢. *[پلار]* ورگی زل ٣. قایشی نێوان دەفە و مەکوکی جۆلایی ٤. دارێکی دەوەنە بەری وەک بەری بادام دەچێ ٥. پەت و گوریسی تایبەت بۆ تەنگ دان ‹گوریسی تەنگ› ☰ ١. تنگ زین و پالان ٢. شکمِ گندە ٣. ابزاری در جولایی ۴. درختچەای است ۵. طنابِ تنگِ ستور

▣ **تەنگ دان**: ١. تەنگە کێشان لە یەکسم ٢. دابەستنی بار بە سەرپشتی بارەبەرەوە ☰ ١. بستن تنگ باربر ٢. بار بستن بر پشت باربر

**تەنگ[2]**: ئاوەڵناو. ١. تەسک؛ دۆخی شوێن یا شتێک کە پانایی کەم بێ ٢. دژوار ‹نەی گوزەرگای تەنگ بازار چەپگەرد/ هەر کاتێ زانای ئەجەل سمکۆ کەرد «مەولەوی»› ٣. تەنک؛ ناسک؛ نازک ‹ئەم قافییەت بە چەشنی دڵی موددەعی، حەسەن!/ تەنگە، درەنگە، مەیلی بە جەنگە، هەڵێ! مەڵێ! «سەیفولقوزات»› ☰ ١. تنگ ٢. دشوار ٣.

نازک

▣ **تەنگی ئێوارە:** ئەنگۆری؛ ئێوارەی درەنگ‌وەخت ⇆ تنگ غروب

▣ **تـەنگ بوونـەوە:** لــە دەســت دانی دۆخــی بەرفراوان. هـەروەها: **تـەنگ کردنـەوە** ⇆ تنـگ شدن

**تەنگ پێهەڵچنین:** تەنگ پـێ‌هەڵـێنان؛ تـەنگ هەڵـچنین؛ تـەنگاو کـردن؛ زۆر بـۆ هێنــان و بێ‌دەرەتان کردن ‹گەمارۆی زەلی نێزە، وا تەنگی پێ‌هەڵچنیون/ کە بێ دەرفەتی پێکەنینن، بە سەد بەرزگی زەردەماسی «سـوارە»› ⇆ در تنگنـا قـرار دادن

**تەنگ پێهەڵێنان:** ☜ **تەنگ پێهەڵچنین**

**تەنگ هەڵچنین:** ☜ **تەنگ پێهەڵچنین**

**بە تەنگی کەسێکەوە بوون:** یارمەتی و هەوڵی زۆر بۆ کەسێک دان ⇆ یار و غمخوار کسی بودن

**وە تەنگ هـاتن:** وەڕەز بوون. هەروەها: **وە تەنگ هێنان** ⇆ بە تنگ آمدن

**تـەنگ ـ**[٢]: پێشوشـە. کــەم‌وکــورت ‹تەنگەبــەر؛ تەنگەنەفەس› ⇆ تنگ ـ

**ـ تەنگ**[٣]: پاشەوشە. ـــ کـەم‌وکـورت ‹بەرچاوتـەنگ؛ دەستەنگ› ⇆ ـ تنگ

**تـەنگاڵ / tengal/**: نـاو. ١. ڕەخ؛ کـەنار ٢. پاڵـوو؛ کەلەکە ‹خەنجەرەک خستە بـەر تەنگاڵـاخووە› ⇆ ١. جنب ٢. پهلو

**تەنگانە**[١] **/ tengane/**: نـاو. تەنگاهی: ١. تـەنگاوی؛ تـەنگژە؛ تـەنگ‌وچەڵـەمە؛ تەنگەبـەری؛ تـەنگی؛ بێ‌دەرەتانی؛ بارودۆخێکی نالەبار کـە لـێ دەربـاز بوونی ئەستەمە ‹شادمانی بێ‌وەفایە، یـاری تێـری و مەستییە/ یاری تەنگانەم غەمە، با هـەر غـەمی خـۆم، خۆم بخۆم «نالی»› ٢. دژواری؛ گـرفتی؛ سـەختی ‹تەنگانـە بـەری کورتـە «مەسـەل»› ⇆ ١. تنگنـا ٢. دشواری

**تەنگانە**[٢]: ئاوەڵناو. تایبەت بە کـاتی بـێ‌دەرەتـانی ‹چون مردنی ئـەو، مـردنی منـە/ گـورزی تەنگانـەی جەنگی دوژمنە «قانع»› ⇆ تنگ

**تەنگاو / tengaw/**: ئاوەڵناو. تەنگەتاو: ١. زۆر تووڕە ٢. زۆر بۆ هاتوو ⇆ ١. بسیار عصبانی ٢. در تنگنا

▣ **تەنگاو بوون:** ١. لە سەختی و سەخڵەتیدا بوون ‹بە مەڕەکەوە هێندە هەراسان و سەخڵـەت بـوون، هێندە تەنگاو بـوون، کوتیـان بـا ئەسـتی بـدەینێ «بـەیت»› ٢. تەنگــەتاو بــوون؛ پێویســت بــە ئاودەست هەبوون ⇆ ١. در تنگنا بودن ٢. احتیـاج دستشویی داشتن

**تەنگاو کردن:** ☜ **تەنگ پێهەڵچنین**

**تەنگاوتیلکە / tengawtîlke/**: ناو. کـاری شـەتەک دانی کۆڵەبار بـە پشـتەوە بـە شـێوەی ڕاسـت و چەپ و زۆر تونـد ⇆ عمـل راسـت و چـپ محکـم بستن کولەبار

**تەنگاوەر / tengawer/**: ناو. دۆڵ؛ گەلی ⇆ درّە

**تەنگاوی / tengawî/**: ☜ **تەنگانە**[١]**ـ١**

**تـەنگبی / tengbî/**: نـاو. ئـــامرازی دابێـــژانی کون‌تەنگ ⇆ غربال ریز

**تەنگدەس / tengdes/**: ☜ **تەنگدەست**

**تەنگدەست / tengdest/**: *[مجاز]* تەنگدەس؛ نـەدار؛ بێ‌پارە؛ بێ‌ماڵ ⇆ تنگدست

**تـەنگز / tengiz/**: نـاو. تنگـز؛ تـەنگیز؛ تینگیـز؛ تەنگـەس؛ تـەنگس؛ تەنگســەک؛ تەنگــەزی؛ چاڵووک؛ چاڵـووک؛ چاڵـۆک؛ بنـەداری تایبـەتی ناوچەگەلی وشـکی کوێسـتانی، بـە لـق و پـۆی دڕکاوی و گوڵی سوورکاڵـی وەک هۆشـە و بـنی زۆر پتەوەوە ⇆ تنگرس

**تـەنگژە / teng(i)je/**: نـاو. ١. شـێوی تەنگەبـەر؛ گەلی تەنگ؛ دۆڵی تەنگ ٢. تەنگانە؛ تەنگەبەری؛ بەرتـەنگی؛ تـەنگی؛ شـوێنێ کـە ژلـێوەیە و کردوکۆشی تێدا ناکرێ ٣. تەنگاوی؛ بێ‌دەرەتانی؛

بارودۆخێکی نالەبار کە لێدەرباز بوونی ئەستەمە ‹بەبێ کورد تەنگژەکانی ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوین چارەسەر ناکرێ› ☰ ١. درّەی تنگ ٢. محیط بستە ٣. تنگنا

**تەنگژەیی / teng(i)jeyî/**: ناو. بەرتەنگی؛ تەنگانە؛ تەنگەبەری ☰ تنگنا

**تەنگس / tengis/**: ☜ **تەنگز**

**تەنگستەن / tengisten/**: ناو. ولفرام؛ توخمی کیمیاوی کانزایی قورس، بە ژمارەی ئەتومی ٧٤ و کێشی ئەتومی ١٨٣,٨٥، کە کانزایەکی پتەو و چەکوچخۆرە ☰ تنگستن

**تەنگسەک / teng(i)sek/**: ☜ **تەنگز**

**تەنگنایەوە / tengnayewe/**: چاوگ. پشکووتاندن ☰ شکوفا کردن

**تەنگوپۆرە / teng û poře/**: ناو. تەنگ و هەر شتی پێویست بۆ بەستن ☰ تنگ و لوازم بستن

⊡ **تەنگوپۆرە دان**: تەنگ دان و قایم کردنی کۆپان یان بار لە سەر پشتی ولاخەوە ☰ محکم بستن بار

**تەنگوترش / teng û tirş/**: ئاوەلناو. تەنگوتورش؛ تەنگوترووسک: ١. تەنگ و خەف؛ کەمدەرەتان و دلگیر ٢. تەنگەبەرە؛ زۆر تەنگ ☰ ١. تنگ و دلگیر ٢. بسیار تنگ

**تەنگوترووسک / teng û t(i)rûsk/**: ☜ **تەنگوترش**

**تەنگوتورش / teng û turş/**: ☜ **تەنگوترش**

**تەنگوتیوار / teng û tîwar/**: ئاوەلناو. تەنگەبەر؛ تەسکوترووسک؛ تەنگوترش؛ بە بۆشایی، پانایی یان بەری زۆر کەمەوە و ☰ بسیار تنگ

**تەنگوچەڵەمە / teng û çełeme/**: ناو. تەنگانە؛ گیروگرفت؛ دژواری و ناخۆشی ☰ تنگنا

**تەنگە / tenge/**: ناو. ١. کەمەربەندی یەکسم ٢. *[بلار]* زگی زل ٣. جێگەی تەسک بوونەوەی دەریا ٤. تەنگەلان؛ قورنووش؛ کەل؛ ناوتەنگ؛ باریکە ئاوێ کە دوو وشکانی لێکدادەبڕێ ٥. سکەی زێڕی ئاسیای ناوەندی ٦. ئامرازێکە لە کەرستەی جووت ☰ ١. تنگ اسب یا الاغ ٢. شکمِ گندە ٣و٤. تنگە ٥. سکەی طلای آسیای میانە ۶ از ابزار شخم

⊡ **تەنگە بوون**: ١. ناچار بوون ٢. پێمل بوون. هەروەها: **تەنگە کردن** ☰ ١. ناچار شدن ٢. تسلیم شدن

**تەنگە دان**: ☜ **تەنگە شەتاندن**

**تەنگە شەتاندن**: تەنگە دان؛ توند کێشانی تەنگە ‹زینی لە سەر نێ تەنگەی بشەتێنێ/ تۆزەک وا دیارە لە بنی ڕەشکێنێ «فولکلۆر»› ☰ محکم بستن تنگ

**تەنگە گرتن**: ١. بریندار بوون بە تەنگە ٢. *[مەجاز]* قسەی گرچووبڕ و تاڵ کردن و بیسەری پێ ڕەنجاندن ☰ ١. زخمی شدن حیوان از تنگ ٢. سخن سخت و تلخ گفتن و شنوندە را آزُردن

**تەنگەئەستوور / tenge'estûr/**: ☜ **تەنگەستوور**

**تەنگەبان / tengeban/**: ئاوەلناو. تەقڵەباز ‹کۆتری تەنگەبان› ☰ مُعلق‌زن

**تەنگەبەر / tengeber/**: ئاوەلناو. تەنگەبەرە؛ بەرتەسک؛ تایبەتمەندی هەر شوێنێ پانایی کەم بێ ‹ئەی بەندەی خودا کوڕی کارەکەر/ گوێ بگرە لە ناو گۆڕی تەنگەبەر «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ تنگ و محدود

⊡ **تەنگەبەر بوون**: ١. بەرتەسک بوون ٢. *[کینایە]* مەودا بۆ کار و چالاکییەک نەبوون ☰ ١. تنگ بودن ٢. امکان کار و فعالیّتی نبودن

**تەنگەبەرە / tengebere/**: ☜ **تەنگەبەر**

**تەنگەبەری / tengeberî/**: ناو. ١. بەرتەسکی ٢. تەنگانە؛ بێدەرەتانی ☰ ١. تنگی ٢. تنگنا

**تەنگەتاو / tengetaw/**: ناو. ١. حاڵەت یا دۆخی

زۆر بۆ هاتن و نیازی زۆر بە ئاودەست ٢. لەز؛ پەلە ▣ ١. فشار اجابت‌مزاج ٢. عجله

**تەنگەتاو[٢]**: ئاوەڵناو. تەنگاو: ١. زۆر تووڕە ٢. زۆر بۆ هاتوو ‹ڕا دەکەن بۆ جانیبی دوکانی جەڕڕاح و تەبیب/ چاک و دامەن هەڵکڕاو و سەرشکاو و تەنگەتاو «نالی»› ▣ ١. بسیار خشمگین ٢. در تنگنا

**تەنگەتاو[٢]**: ئاوەڵکار. وەپەلە کەوتوو ▣ شتابزده

⊡ **تەنگەتاو کردن**: زۆر بۆ هێنان ▣ فشار آوردن

**تەنگەتیلک** / tengetîlik/: ☜ **تەنگەتیلکە**

**تەنگەتیلکە** / tengetîlke/: ئاوەڵناو. تەنگەتیلک؛ تەنگەتیلەکە: ١. ڕقهەستاو؛ تووڕە ٢. *[پلار]* زگ‌زل ▣ ١. خشمگین ٢. شکم‌گنده

**تەنگەتیلەکە** / tengetîleke/: ☜ **تەنگەتیلکە**

**تەنگەجیقەڵدان** / tengecîqełdan/: ناو. *[کینایە، پلار]* بێ‌جیکەڵدان؛ فرش‌تەنگ؛ کەم‌جیقڵدانە ▣ کم‌ظرفیت

**تەنگەچەری** / tengeçerî/: ناو. تەنگەخەری؛ جەندرمە؛ پۆلیسی ڕێگا و بان ▣ ژاندارم

**تەنگەخەری** / tengexerî/: ☜ **تەنگەچەری**

**تەنگەزکری** / tengezikrî/: ناو. تەمەڵی؛ تەوەزەلی ▣ تنبلی

**تەنگەزی** / tengezî/: ☜ **تەنگز**

**تەنگەس** / tenges/: ☜ **تەنگز**

**تەنگەستوور** / tengestûr/: ئاوەڵناو. *[پلار]* تەنگەئەستوور؛ زگ‌زل ▣ شکم‌گنده

**تەنگەکێش** / tengekêş/: ناو. کەژووی ژێر سنگی بارەبەر ▣ تنگەی حیوان باری

**تەنگەگر** / tengegir/: ناو. ١. پشتێنەی وا کە ئەسپ زامار بکا ٢. *[مەجاز]* قسەی ڕەق ▣ ١. نرمه‌ای که پشت اسب را زخم کند ٢. سخن رُک

**تەنگەلان** / tengelan/: ئاوەڵناو. تەنگەبەر ‹ئەوسا پێتەختیان قەلاچوالان بوو/ قەلاچوالانیش زۆر تەنگەلان بوو «قانع»› ▣ تنگ

**تەنگەڵان** / tengełan/: ناو. تەسکایی لە زەریا؛ زەریای نێوانی دوو چیا ▣ تنگه

**تەنگەنەفەس** / tengenefes/: ئاوەڵناو. ١. هەناسە/ پشوو سوار ٢. *[کینایە]* بێ‌سەبر؛ بێ‌تاقەت ▣ ١. تنگ‌نفس ٢. ناشکیبا

**تەنگەنەفەسی** / tengenefesî/: ناو. ١. نەخۆشینی هەناسەسواری ٢. *[کینایە]* بێ‌ئارامی؛ بێ‌تاقەتی ▣ ١. آسم ٢. ناشکیبایی

**تەنگی** / tengî/: ناو. ١. بچووکی؛ تەسکی ٢. تەنگانە؛ ناخۆشی ٣. کەمی؛ کورتی ▣ ١. تنگی ٢. سختی ٣. ضیق

**تەنگیایەوە** / tengyayewe/: چاوگ. پشکووتن ▣ شکوفا شدن

**تەنگیز** / tengîz/: ناو. گوێژ؛ گێوژ؛ بلچ ▣ زالزالک

**تەننگ** / tennig/: ئاوەڵناو. ١. تەنک؛ کەم‌قووڵ ٢. ناسک؛ نازک ▣ ١. کم‌عمق ٢. نازُک

**تەنوا** / tenwa/: ئاوەڵناو. گەمار؛ چڵکن؛ پیس؛ چەپەڵ ▣ کثیف

**تەنوایی** / tenwayî/: ناو. گەماری؛ چڵکنی؛ پیسی ▣ کثافت

**تەنور** / tenur/: ☜ **تەنوور**

**تەنور** / tenûr/: ناو. تەندوور؛ تەندور؛ تەنور؛ ترین؛ ئارگوون؛ ئارتوون؛ ئێتوون؛ قووڵکەی خڕی ئاگردان زۆرتر بۆ نان کردن ‹خۆم هاویشتە ناو گڕی سوور/ گڕ چی؟ وەکوو گڕی تەنوور «هەژار، بۆ کوردستان»› ▣ تنور

⊡ **تەنور داخستن**: هەڵکردنی تەنوور؛ ئاگر لە تەندووردا کردنەوە ▣ تنور افروختن

**تەنورسڕ** / tenûrsiř/: ☜ **تەنورماڵ**

**تەنورشێوێن** / tenûrşêwên/: ناو. کۆڵەوەژ؛ کۆڵەوژ؛ تیکە دارێکی درێژ کە بنی تەندووری پێ تێک‌وەردەدەن ▣ چوبی که خاکستر و آتش تنور را با آن زیر و رو کنند

**تەنورماڵ / tenûrmał**: ناو. تەنوورسڕ؛ ئەو پەڕۆ تەڕەی کە بە سەر داریەوە دەپێچن و تەنووری پێ خاوێن دەکەنەوە ≌ باردیچ

**تەنـووره / tenûre**: نـاو. ١. زارکـی دۆلاش ٢. گێژەلووکە ٣. گرمە و گوڕە؛ گرمەگرم و هاڕە ٤. داوێنی کراسی ژنانە ٥. شۆڵەی بەرزی ئاگر ≌ ١. دهانەی ناو آسیاب ٢. گردباد ٣. غُرّش ٤. دامن ٥. شعلەی بلند آتش

**تەنوری / tenûrî**: ئاوەڵناو. ١. تایبەت بە تەنوور ‹نانی تەنووری› ٢. *[کینایە]* برژاو؛ پیشاو ≌ ١و٢. تنوری

**تەنە¹ / tene**: ناو. لاشان؛ گورمش؛ شان ≌ تنه

◘ **تەنە لێدان**: شان لێدان؛ شان پێداکوتان؛ شان بە کەسێدا ماڵین ≌ تنه زدن

. **تەنە²**: پاشەوشە. کەسی ‹یەکتەنە بەرەنگاری بوو› ≌ ـ تنه

**تەنەشۆر / teneşor**: ناو. تاتەشۆر؛ ئەو تەختە بەردە مردووی لە سەر دەشۆن ≌ سکوی غُسل میت

**تەنەکە / teneke**: ناو. ١. پووت؛ پۆت؛ پێوانەیەکە نزیکەی شازدە کیلۆ ڕۆن دەگرێ ٢. تانکی؛ دەفری گەورەی تراو ٣. ڕووپەڕێکی ناسکی ئاسن کە بە توێژێکی قەلا داپۆشراوە ≌ ١. پیت ٢. تانکر مایعات ٣. حلبی

**تەنەکەچی / tenekeçî**: ☜ **تەنەکەساز**

**تەنەکەساز / tenekesaz**: ناو. تەنەکەچی؛ وەستای تەنەکەکاری ≌ حلبی‌ساز

**تەنەوە / tenewe**: ناو. تەشەنە؛ کار و ڕەوتی تەنینەوە؛ پەرە گرتن ≌ سرایت

**تەنها / tenha**: ☜ **تەنیا**

**تەنهایی / tenhayî**: ☜ **تەنیایی**

**تەنی¹ / tenî**: ناو. ١. نانی تەندووریی ناسک ٢. قورمی مەنجەڵ؛ ڕەشایی نیشتووی دووکەڵ ≌ ١. نان لواش ٢. سیاهی دیگ

**تەنی²**: ئاوەڵناو. تەنک؛ ناسکی سووک ≌ نازکِ تُنُک

**تەنیا¹ / tenya**: ئاوەڵناو. تەنها؛ تەینا ‹پیاوی تەنیا چ بکا؟› ≌ تنها

**تەنیا²**: ئاوەڵکار. تەنها؛ تەینا؛ بە تەنیایی ‹تەنیا جارێک ڕۆیشتووم› ≌ تنها

**تەنیا ـ³**: پێشوشە. یەک؛ تەنها ‹تەنیاباڵ؛ تەنیاکوڕ› ≌ تک ـ

. **تەنیا⁴**: پاشەوشە. تەنها؛ تاق ‹دەس‌تەنیا› ≌ تنها ـ

**تەنیاباڵ / tenyabał**: ئاوەڵناو. تەیناباڵ؛ بێیاریدەر و هاوکار ≌ دست‌تنها

**تەنیاباڵی / tenyabałî**: ناو. بێکەسی؛ بێهاودەمی ≌ بی‌کسی

**تەنیاگ / tenyag**: ☜ **تەنراو**

**تەنیایی / tenyayî**: ناو. تەنهایی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی تەنیا بوون ‹ئەو لە تەنیایی دەترسا› ٢. دووری یان جیایی لە دیتران ‹تەنیایی هەر بۆ خوا خاسە «مەسەل»› ≌ ١و٢. تنهایی

**تەنیشت¹ / tenîşt**: ناو. ١. لاکەلەکە ٢. پاڵ؛ پەنا ≌ ١. پهلو ٢. کنار

**تەنیشت²**: ئامراز. لای؛ پاڵی ≌ پهلوی؛ جنبِ

**تەنیک / tenîk**: ناو. میکروب؛ تەنیلە ≌ میکروب

**تەنیلە / tenîle**: ئاوەڵناو. بە خەڕەک ڕێسراوی ئامادەی کار ≌ ریسیده

**تەنیمۆک / tenîmok**: ناو. قورم؛ دوودە ≌ دوده

**تەنین / tenîn**: چاوگ. چنین؛ تەنای؛ تێک‌کێشانی تەنگی هەودا و تاڵ لە یەکتریدا ‹لق‌وپۆپ و هەژگەڵ/ وەها دوەر و پشتی تەنیون/ کە بێ فرسەتی چاوبڕکێ لەگەڵ عەرشی پاکن «سوارە»› ≌ تنیدن

**تەنینەوە / tenînewe**: چاوگ. ١. دیسانەوە تەنین ٢. تەشەنە کردن؛ داگرتن ≌ ١. بازتنیدن ٢.

سرایت کردن

**تەنێ / tenê/**: ئاوەڵناو. تەنیا؛ تاق و تەنیا ‹بارگەیان تێکەوە پێچاوە، بەڕێ بوون یاران/ لە دنێ وا بە تەنێ پاشی ئەوان من چ بکەم؟ «هێمن»› ☰ تنها

**تەنێتی / tenêtî/**: ناو. تاقانەیی؛ یەکایەتی؛ تەنیایی ☰ وحدانیّت

**تەو[1] / tew/**: ناو. ١. پەزی ڕەنگ بۆر؛ مەڕی خۆڵەکەوە ڕەنگ ٢. تا؛ یاو ☰ ١. گوسفند خاکستری ٢. تب

**تەو[2]**: دەنگ. ١. دەنگی بانگ کردنی مێگەل بۆ ئاو خواردنەوە ٢. وشەی پەسند بۆ گۆرانیبێژ ☰ ١. صدای خواندن گلە بە آبخوری ٢. حرف تحسین خواننده

**تەوا / tewa/**: ناو. تەما؛ چاوەڕوانی ☰ چشمداشت

**تەوات / tewat/**: ناو. تاقەت و پشووداری؛ سەبر و حەوسەڵە ☰ بُردباری

**تەوادار / tewadar/**: ☜ تەمایەر

**تەوار / tewar/**: ناو. تاوار: ١. بازی مێوینە؛ مێچکەی باز ٢. *(مەجاز)* منالی خڕوخۆڵ و هەراش ☰ ١. بازِ مادە ٢. کودک چاقالو

**تەوارە / teware/**: ناو. دەغلی پێگەیشتوو ☰ غلّەی رسیدە

**تەوازوو / tewazû/**: ☜ تەوازی

**تەوازی / tewazî/**: ناو. تەوازوو؛ عوزرخوازی؛ داوای لێبوردن ☰ پوزش

**تەواسا / tewasa/**: ئاوەڵناو. تاساو؛ وڕ و گێژ ☰ گیج و منگ

**تەواسان / tewasan/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //تەواسای؛ دەتەواسێی؛ بتەواسێ// ١. گێژ بوون؛ تاسان ‹کە بەرد ئەمەی وت ساتێ حەپەسام/ پشووم لێ بڕا، تەواو تەواسام «قانع»› ٢. دڵسارد بوونەوە؛ ناهمێ بوون ☰ ١. گیج شدن ٢. دلسرد شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: تەواساو/ چاوگی نەرێنی: نەتەواسان

**تەواساندن / tewasandin/**: چاوگ. تەوەسانای؛ وەستاندن ☰ هوش از سر پراندن

**تەواسانن / tewasanin/**: چاوگ. ١. تاساندن ٢. دڵسارد کردنەوە؛ ناهومێد کردن ☰ ١. گیج کردن ٢. دلسرد کردن

**تەواسیان / tewas(i)yan/**: چاوگ. ١. تاسان ٢. دڵسارد بوونەوە؛ ناهومێد بوون ☰ ١. گیج شدن ٢. دلسرد شدن

**تەواسیانەوە / tewas(i)yanewe/**: چاوگ. دڵسارد بوونەوە ☰ نومید شدن

**تەواسیای تەوەس / tewasyaytewes/**: سارستە. چش لە هەر شتێ؛ بە جەحەندەم ☰ بە درک

**تەواش / tewaş/**: ناو. چەورایی؛ چەوری؛ زەرنووقایی ☰ چربی

**تەواشا / tewaşa/**: ☜ تەماشا

**تەواشاخانە / tewaşaxane/**: ☜ تەماشاخانە

**تەواف / tewaf/**: ناو. تواف؛ کاری بە دەوری شتێکی پیرۆزدا گەڕان ☰ طواف

**تەواڵ / tewał/**: ناو. باڵندە ☰ پرندە

**تەوانج / tewanc/**: ☜ توانج

**تەوانچە / tewançe/**: ☜ دەمانچە

**تەواندن / tewandin/**: چاوگ. ١. قەد کردن؛ دوو لا کردنەوە ‹خوە ل بەر بەژنا تە تەواندن› ٢. لێکپێچان؛ لوول دان ‹شیشێن د سۆڕ تێدا تەواند/ فەریاد ژ دەستێ فیرقەتێ «مەلای جزیری»› ☰ ١. تاکردن ٢. پیچیدن

**تەواو[1] / tewaw/**: ئاوەڵناو. تەواو: ١. تم؛ بێکەموکووڕی ٢. خەلاس؛ کۆتایی هاتوو ☰ ١. تمام؛ بی‌کم‌وکاست ٢. پایان‌یافته

⊡ **تەواو بوون**: ١. دروست و بێکەمایەسی بوون ٢. نەمان؛ هاتنە ئەنجام؛ خەلاس بوون ☰ ١. بی‌کم‌وکسر بودن ٢. به اتمام رسیدن

**تەواو دان:** ☜ **تەواو کردن ـ۱و۲**

**تەواو کردن:** ۱. تەواو دان؛ پێک‌هێنان و ئەنجام‌دان ۲. تەواو دان؛ نەهێشتنەوە ۳. [کینایە] سەر نانەوە؛ مردن ☰ ۱. به انجام رسانیدن ۲. باقی نگذاشتن ۳. مُردن

**تەواو**[۲]: ئاوەڵکار. تواو: ۱. گش؛ گشت؛ هەموو ‹تەواو کوتابوویان› ۲. یەکجار؛ گەلێک؛ زۆر ‹تەواو نەخۆشە؛ تەواو کولە› ☰ ۱و ۲. خیلی

**تەواوکەر / tewawker/:** ئاوەڵناو. ۱. کۆتایی‌پێهێنەر ۲. پێ‌تەواو؛ کامڵ‌کەر ☰ ۱. پایان‌دهنده ۲. مُکمل

**تەواوەتی**[۱] **/ tewawetî/:** ئاوەڵناو. گشت؛ هەموو ‹تەواوەتی ئەم شارە ئەیناسن› ☰ همگی

**تەواوەتی**[۲]: ئاوەڵکار. تەواو؛ بە تەواوی؛ بە کاملی و بێ‌کەم‌وکورتی ‹تەواوەتی نانەکەی خوارد› ☰ بی کم‌وکاست

**تەواوی**[۱] **/ tewawî/:** ناو. کۆتایی ☰ پایان؛ تمامی

**تەواوی**[۲]: ئاوەڵناو. ۱. بێ‌کەمایەسی ۲. گش‌لەگش ☰ ۱. بی‌کم‌وکاستی ۲. همگی

**تەواوی**[۳]: ئاوەڵکار. گشت؛ هەموو ‹تەواوی نەناردووە، بڕێکی گل داوەتەوە› ☰ همگی

**تەوبە / tewbe/:** ☜ **تۆبە**

**تەوتەبە / tewtebe/:** ناو. دارەسمە؛ دارتەقێنە ☰ دارکوب

**تەوتین / tewtîn/:** چاوگ. هەدا دان؛ ئۆقرە گرتن ☰ آرمیدن؛ آرام گرفتن

**تەوجی / tewcî/:** ناو. باربوو؛ کۆمەکی ماڵیی بە هەرەوەز ☰ همیاری

**تەوخ / tewx/:** ناو. کوول؛ کوویل؛ زاخە؛ هۆڵەمەڕ لە نێو زەمیندا ☰ زاغه

**تەور**[۱] **/ tewr/:** ناو. ۱. بیور؛ بەڵتە؛ ئامرازی دار بڕین ‹درەخت بجووڵێ لێرە بۆ ئەوێ/ تەور و تەوراسی نزیک ناکەوێ «قانع»› ۲. جۆر؛ چەشن ۳. ڕەوت؛ شێوە؛ ڕەفتار ‹من لە تەوری عالەم و دەوری فەلەک/ زەربی لازیب، زەخمی بێ‌مەرهەم دەخۆم «نالی»› ☰ ۱. تبر ۲. نوع؛ گونه ۳. رفتار

⊡ **تەور (کەسێ) لەق بوون:** سووک و چرووک بوون ‹ئەو کوڕە یەکجار تەوری لەقە› ☰ جلف بودن

**تەور**[۲]: ئامراز. تەنانەت ☰ حتی

**تەورادین / tewradîn/:** ☜ **تەورزین**

**تەوراس / tewras/:** ☜ **تەورداس**

**تەورداس / tewrdas/:** ناو. تەوراس؛ داسی لکەدار پەڕاندن ☰ داس بلند شاخه‌بُری

**تەورزین / tewrzîn/:** ناو. تەڤرزین؛ تەورادین؛ تەوەرزین؛ تەڤەر؛ چەکێ بووە وەک تەور، بە دەستی سوارەوە (وەک ئەوەی دەروێشان دەیخەنە سەر شان) ☰ تبرزین

**تەورک / tewrik/:** ناو. بلوور؛ بلۆر؛ جۆرێ شیشەی جوان ☰ بلور

**تەورلەق / tewrleq/:** ئاوەڵناو. ۱. سەرعەرز؛ دەس‌نەوێساو ۲. سووک؛ قرۆفڕ ☰ ۱. بی‌تربیت ۲. جلف

**تەورۆکە / tewroke/:** ناو. نەجاخ؛ نەژاخ؛ تەوری پچووک ☰ تبر کوچک

**تەورین / tewrîn/:** چاوگ. هەڵاتن؛ دەرچوون ☰ دررفتن

**تەورێزی**[۱] **/ tewrêzî/:** ناو. ۱. مەن؛ کێشێکە بەرانبەربە سێ کیلۆ ۲. دارقەڵەم؛ دارشۆخ؛ جۆرێ چنار ☰ ۱. من؛ سه کیلو ۲. چنار تبریزی

**تەورێزی**[۲]: ئاوەڵناو. سەر بە شاری تەورێز لە باکووری ڕۆژاوای ئێران ☰ تبریزی

**تەوز / tewz/:** ناو. خشڵ؛ خەمل ☰ زیور

**تەوزاندن / tewzandin/:** چاوگ. ڕازاندنەوە؛ جوان کردن ☰ آراستن

**تەوزە / tewze/:** ناو. ۱. حەنەک؛ شۆخی؛ قسەی گاڵتە ۲. ڕشخەن؛ تیز؛ کاری گاڵتە کردن بە

کەسێ 🇮🇷 ١. شوخی ٢. ریشخند
◻ **تەوزە پێکردن:** تیز پێکردن؛ گاڵتە پێ‌کردن 🇮🇷 ریشخند گرفتن
**تەوزی** / tewzî/: ئاوەڵناو. پێویست؛ پێداویست 🇮🇷 لازم؛ ضروری
**تەوزیم** / tewzîm/: ناو. ئەرک؛ کاری سەرشان؛ کارێ کە پێویستە بکرێ 🇮🇷 وظیفه؛ تکلیف
**تەوژم** / tewijm/: ناو. تەوشم؛ زیپ؛ گوشار؛ گوڤاش؛ گەرمش: ١. نهێم؛ لێش؛ هێزێ کە بە هۆی شتێکەوە دەخرێتە سەر شتێکی‌تر ٢. توندی؛ زۆری ‹تەوژمی سەرما› 🇮🇷 ١. فشار ٢. شدّت
◻ **تەوژمی خوێن:** ١. زەخت/ گوشاری خوێن؛ گوشارێ کە خوێن دەیخاتە سەر دیوارەی ڕەگەکانەوە ٢. نەخۆشی بەرز و نزمی تەوژمی خوێن 🇮🇷 ١و٢. فشارخون
**تەوژمی هەوا:** تەوژمێ کە کەش دەیخاتە سەر ڕووکاری زەوین 🇮🇷 فشارِ جو
◻ **تەوژم دان:** زۆر بۆ هێنان 🇮🇷 فشار آوردن
**تەوژمدراو** / tewijmd(i)raw/: ئاوەڵناو. هل‌گوڤاشتی 🇮🇷 تحت فشار
**تەوس** / tews/: ناو. ١. تیز؛ تانە؛ قسەی بەتێکوڵ ٢. خاوی؛ لەش داهێزاوی 🇮🇷 ١. طعنە ٢. بی‌حالی
◻ **تەوس کردن:** خاو بوونەوە؛ هەست و خوست لێبڕان لە بەر ئێش ‹دارێکی کێشا ناو شانما، تەوسم کرد› 🇮🇷 بی‌حال شدن
**تەوسکە** / tewske/: ناو. هەنجیرەکێویلە 🇮🇷 انجیر کوهی
**تەوسین** / tewsîn/: چاوگ. تێنەپەڕ. //تەوسیت؛ دەتەوسی؛ بتەوسە// تاسان؛ گێژ و وڕ بوون 🇮🇷 گیج و منگ شدن
■ ئاوەڵناوی بەرکاری: تەوسیو/ چاوگی نەرێنی: نەتەوسین
**تەوش** / tewş/: ئاوەڵناو. ١. تراو؛ شل ٢. هیچ‌وپووچ؛ بێ‌نرخ ‹قسەی تەوش و بێ‌مانا› ٣. ناجۆر؛ نەگونجاو 🇮🇷 ١. آبکی ٢. بی‌ارزش ٣. ناهنجار
**تەوشک**[1] / tewişk/: ناو. کەش؛ هەوای دەوراندەوری زەوین 🇮🇷 جوّ زمین
**تەوشک**[2]: پێرۆ. ← **تاموتەوشک**
**تەوشم** / tewişm/: ☜ **تەوژم**
**تەوشوێ** / tewş(i)wê/: ☜ **تەشوێ**
**تەوشو** / tewşû/: ☜ **تەشوێ**
**تەوشی** / tewşî/: ☜ **تەشوێ**
**تەوشێ** / tewşê/: ☜ **تەشوێ**
**تەوغی** / tewğî/: ناو. چەق؛ ڕەوتی کەر هاتن؛ گزیر هاتنی میچ 🇮🇷 گود افتادن شتالنگ
**تەوفیر** / tewfîr/: ناو. جیاوازی 🇮🇷 تفاوت
**تەوق**[1] / tewq/: ناو. ١. ئاڵقەی لە ئاسن ٢. گەوی دەوری مل و گەردن ‹تەوق خەم گەردەن شەوقەکەم بەستەن/ کەف پای شادیم خار تێ شکەستەن «مەولەوی»› ٣. تەشق؛ بانترین شوێن ‹دەسبەجێ هەروەک موهەندیس دامە بەر مەددی نەزەر/ هەر لە تەوقی سەریەوە تا نووکی پەنجەی خوار و ژوور «شێخ ڕەزا»› ٤. یەکەیێ بۆ دار و گژ و گیا ‹تەوقێ کەوەر لە ناو پیازەکەدا سەوز بووە› 🇮🇷 ١. حلقەی آهنی ٢. طوق ٣. تارک ۴. واحدی برای درخت و گیاه
**تەوق**[2]: ئاوەڵناو. نەگونجاو و بەدکردار 🇮🇷 نابکار
**تەوقات** / tewqat/: ناو. ئیشت؛ شەپلاخەی پشتەمل 🇮🇷 سیلی پشت گردن
**تەوقە** / tewqe/: ناو. ١. خشڵێکە وەک ماشەی ئاگر زلف و بسکی پێ دەگرن و ڕادەگرن ٢. تۆقە؛ کاری دەست لە دەست نان؛ دەستی یەکتر گوشین ‹من وامزانی تەوقەیەکە ڕاگوزاری و/ ئیتر دەستم دەستەکانت بەجێ دێڵێ «شێرکۆ»› 🇮🇷 ١. از زیورآلات گیسو ٢. عمل دست دادن
◻ **تەوقە کردن:** دەست دان 🇮🇷 دست دادن

**تەوقەتە / tewqete/:** ناو. پۆپە؛ شوێنی هەرەبەرز لە چیا و دار و ... 🇮🇷 بُلندا

**تەوقەسەر / tewqeser/:** ناو. ١. تەشق؛ تەوقەتە؛ بەرزترین شوێن ‹چیا لە تەوقەسەری داڕژاوە تا کەمەری/ چو زولفی سونبولی دەرهەم، چو پەرچەمی بەڕەزا «حاجی قادر»› ٢. تەپلی سەر 🇮🇷 ١. بُلندا ٢. تارک

**تەوقەگوڵ / tewqegul/:** ناو. شاپەسەن؛ دارچکێکە گوڵی لە هەموو ڕەنگی هەیە و گەڵاکەی بە کوڵاوی بۆ دەرمانی ددانەکیرە بەکەڵکە 🇮🇷 شاەپسند

**تەوقەن / tewqen/:** ناو. تەوقەنە؛ تەشق؛ بەرزترین جێ 🇮🇷 بالاترین نقطه

**تەوقەنە / tewqene/:** ☜ تەوقەن

**تەولاندن / tewlandin/:** چاوگ. کردنە تەوێڵەوە 🇮🇷 در طویله کردن

**تەوڵ / tewł/:** ناو. زەنگۆڵە 🇮🇷 زنگوله

**تەوڵباز / tewłbaz/:** ناوەڵناو. سەرسەری؛ سەرچڵ؛ سەرپۆت 🇮🇷 سطحی؛ سرسری

**تەوڵە / tewłe/:** ناو. ١. ☜ تەوێڵە ٢. تەڵە؛ داو 🇮🇷 ١. ☜ تەوێڵە ٢. تله

**تەومان / tewman/:** ناو. دەرپێ؛ شواڵ 🇮🇷 تُنبان

**تەون / tewn/:** ناو. ١. تەڤن؛ کاری تەنین بە خوری و موو (پتر ڕایەخ) ٢. تەنراو بە دارەوە (پتر ڕایەخ) ٣. بەرد؛ کوچک 🇮🇷 ١. عمل بافتن (فرش) ٢. بافته (فرش) ٣. سنگ

◘ **تەون دانە دەسەوە:** [کنایە] بە کارێکی دژوارەوە سەرقاڵ بوون/ کردن؛ دەست بە کارێکەوە دان کە لێی خەلاس بوون ئەستەم بێ ‹من چەم بوو بە سەر ئەم کار و بارەوە؟ ئەم تەونە چە بوو دامە دەس خۆمەو؟! «فولکلۆر»› 🇮🇷 گرفتار کاری دشوار شدن/ کردن

**تەون کردن:** ڕایەخ چنین 🇮🇷 فرش بافتن

**تەون هەڵخستن:** تەون نانەوە 🇮🇷 دارقالی گذاشتن

**تەونکەر / tewnker/:** ☜ تەونگەر

**تەونگەر / tewnger/:** ناو. تەونکەر؛ تەونەکەر؛ تەونەگەر؛ کەسێ کە ڕایەخ دەتەنێ 🇮🇷 بافنده

**تەونوبەست / tewn û best/:** ناو. کار و ڕەوتی پیلان ڕشتن؛ کەین و بەین بۆ کارێکی ناڕەوا 🇮🇷 توطئه

**تەونۆکە / tewnoke/:** ناو. تەونی جاڵجاڵووکە؛ تاری کاکڵەمووشان 🇮🇷 تار عنکبوت

**تەونەکەر / tewneker/:** ☜ تەونگەر

**تەونەگەر / tewneger/:** ☜ تەونگەر

**تەووسا / tewusa/:** سارستە. خۆزگە؛ خۆزگا؛ خۆزیا 🇮🇷 ای کاش

**تەوەر / tewer/:** ناو. ١. بیور؛ تەور ٢. ☜ تەوەرە 🇮🇷 ١. تبر ٢. ☜ تەوەرە

**تەوەرداس / tewerdas/:** ناو. کولاو؛ تەرداس 🇮🇷 داس چوببُری

**تەوەرزین / tewerzîn/:** ☜ تەورزین

**تەوەرگ / tewerg/:** ☜ تەرزە

**تەوەرگە / tewerge/:** ☜ تەرزە

◙ **تەوەرگە ژێلێ:** گلێرکە؛ تەرزەی ورد 🇮🇷 تگرگ ریز

**تەوەرە / tewere/:** ناو. تەوەر: ١. بەڵا و دەرد ٢. ئاژاوە و بشێوە ٣. خڕ و گرۆوەرێک کە بەرداشی لە سەر دەگەڕێ ٤. هێڵ یان بەشی ناوەکی و سەرەکی کە بەشەکانی‌تر لە دەوری هەڵدەسووڕێن و جێگیر دەبن ‹تەوەرە گرنگەکانی کۆ بوونەوەی ئەمڕۆی ئەنجومەنی وەزیران› 🇮🇷 ١. آسیب؛ گزند ٢. آشوب؛ بلوا ٣. محور سنگ آسیا ٤. محور

**تەوەڕک / teweřik/:** ناوەڵناو. پیرۆز؛ ممبارەک 🇮🇷 با برکت

**تەوەزەل / tewezel/:** ناوەڵناو. تەمەڵ؛ تەوەزەل؛

تەپ؛ لەش‌گران ☰ تنبل

**تەوەزەلی / tewezelî/**: ناو. تەمەڵــی؛ خوێپــان؛ کەلبایە ☰ تنبلی

**تەوەزەڵ / tewezeł/**: ☜ تەوەزەل

**تەوەسنای / tewesnay/**: ☜ تەواساندن

**تەوەسیای / tewesyay/**: چاوگ. تەواسان؛ تەیرین؛ وەستان ☰ تباسیدن؛ هوش از سر پریدن

**تەوەش / teweş/**: ئاوەڵناو. تــەوش؛ پــووچ و بێ‌بەهرە؛ هیچ‌وپووچ ☰ پوچ؛ بی‌بهره

**تەوەشق / teweşq/**: ☜ تەشق

**تەوەق / teweq/**: ☜ تەبەق

**تەوەقە / teweqe/**: ☜ تەبەقە ـ٢

**تەوەکل / tewekil/**: ناو. ئاونگی لە دار بۆ دانەوێڵە ☰ آونگ چوبی

**تەوەکڵ / tewekił/**: ناو. کاری پشت بەستن بە کەسێ یان شتێ ☰ توکل

**تەوەل / tewel/**: ئاوەڵناو. ١. یارمباز ٢. سەرسەری ٣. بەدفەڕ ٤. بێ‌ئاکار ☰ ١. شارلاتان ٢. سبکسر ٣. موذی ۴. نابکار

**تەوەلا / tewla/**: ئاوەڵناو. لانەواز؛ تەرە ☰ لانەگریز؛ آوارە

**تەوەن / tewen/**: ناو. بەرد؛ تەڤەنی؛ تووەنی ☰ سنگ

**تەوەنتاش / tewentaş/**: ناو. بەردتاش؛ کەڤرتراش ☰ سنگتراش

**تەوەنە / tewene/**: ناو. ١. کۆگا؛ تۆپەڵ ٢. ☜ تەبەنە ☰ ١. کپە ٢. ☜ تەبەنە

⊡ **تەوەنە دان**: لێک‌هالان؛ لێک‌کۆبوونەوە ☰ کُپە شدن

**تەوەنەفڕێ / tewenef(i)řê/**: ناو. بەردەفڕکێ؛ شەڕەبەرد؛ کاری کەڤر بۆ هەڤدوو ئاویتن ☰ سنگ‌پرانی

**تەوەنی / tewenî/**: ناو. بەرد؛ کەڤر؛ کوچک ☰ سنگ

**تەویر / tewîr/**: ناو. ١. چەشن؛ تەرز؛ جۆر ٢. تەگبیر «کەنیشکە بێرۆ بۆ لای من ڕاکە!/ تەویرم کردوو تەویرێ چاکە «فولکلۆر»» ☰ ١. طور؛ نوع ٢. تدبیر

**تەویلە / tewîle/**: ☜ تەوێڵە

**تەوێشق / tewêşq/**: ناو. تەشق؛ حەوێق؛ پەڕپەڕۆچکە؛ بەرزایی ئاسمان ☰ اوج

**تەوێڵ / tewêł/**: ناو. هەنیە؛ جەمین؛ ئەنی؛ تووێڵ؛ ناوچاوان؛ بەشێ لە لای ژووروی ڕوومەت، لە سەر چاوەوە هەتا خەتی مووی سەر ☰ پیشانی

**تەوێڵە / tewêłe/**: ناو. تاوڵە؛ تەوڵە؛ تەویلە؛ تێوڵە؛ گەوڕ؛ پشتێر ☰ طویلە

**تەهـ / teh/**: دەنگ. تەحا؛ پەحا؛ وشەی سەیر مان ☰ وە؛ کلمەی تعجب

**تەها[1] / teha/**: ئاوەڵناو. بێ‌وێنە؛ یەکە ☰ تک؛ بی‌مانند

**تەها[2]**: دەنگ. تەحا؛ تەهـ ☰ وە؛ کلمەی تعجب

**تەهتاڤک / tehtavik/**: ناو. پنگە کێویلە ☰ نعنای کوهی

**تەهرە / tehre/**: ناو. دەسرۆکەی هەوری ☰ دستمال

**تەهس / tehs/**: ئاوەڵناو. لووس؛ خلیسک؛ خز ☰ لیز

**تەهساندن / tehsandin/**: چاوگ. هەڵخلیسکاندن ☰ لغزاندن

**تەهسۆک[1] / tehsok/**: ناو. جێگەی خلیسک ☰ مکان لغزندە

**تەهسۆک[2]**: ئاوەڵناو. خزۆ؛ خز ☰ لغزندە

**تەهسین / tehsîn/**: چاوگ. شەمتین؛ هەڵخلیسکان ☰ لغزیدن

**تەهلک / tehlik/**: ناو. تەحلک؛ تالک؛ فرچەتاڵ؛ گڕکەتاڵ ☰ خربزە و طالبی نرسیدە و تلخ

**تەهلوکەڕێ / tehlûkeřê/**: ناو. ڕێگای سەخت و

هەڵەمووت ⇐ راه دشوارگذر

**تەهۆ / teho/**: دەنگ. هەیهوو؛ وشەی نەشیاوی ⇐ هیهات

**تەهۆڵ / tehoł/**: ناو. ڕەهۆڵ؛ قەڵشی قووڵ و هەراو ⇐ شکاف ژرف و گشاد

**تەهو / tehû/**: دەنگ. وشەی سەیر مان ⇐ وه؛ کلمەی تعجب

**تەی¹ / tey/**: ناو. ١. مەرج؛ پەیمان ٢. کاری پێوان؛ بڕین (ڕێگا) ٣. کاری بڕینەوە (مامەڵە) ٤. دوایی؛ کۆتایی ⇐ ١. پیمان ٢و٣. طی ٤. پایان

▣ **تەی بون**: دوایی هاتن ‹شەوی هیجر و بەقای عومری ڕەقیبم/ خودا تەی بێ، خودا تەی بێ، خودا تەی «نالی»› ⇐ طی شدن

**تەی کردن**: ١. پێوان ‹بلا سا شار بە شار و دێ بە دێ بین/ لە دەس یاران بکەین تەیی ولاتان «نالی»› ٢. بڕینەوە؛ قەول و قەرار دانان ⇐ ١و٢. طی کردن

**تەی²**: ئاوەڵناو. ١. کەدی؛ کەوی؛ ڕام ٢. فێرەکار؛ لەکارزان ٣. دەستێکسپی (مەڕ) ⇐ ١. رام ٢. کارآموخته ٣. یک دست سفید (گوسفند)

**تەیا / teya/**: ئاوەڵناو. ڕێلێشێواو؛ ڕێگومکردوو؛ ڕێکوندکری ⇐ گم کرده راه

**تەیاخ / teyax/**: ناو. پەیاخ؛ پەیاغ؛ گالۆک؛ داردەستی ئەستوور ⇐ چُماق

**تەیار / teyar/**: ئاوەڵناو. ١. ساز و ئامادە بۆ کار یان سەفەر ٢. کەیفساز و دەوڵەمەند ⇐ ١. آماده؛ مُهیا ٢. دارا

**تەیارە / teyare/**: ناو. ١. لیسی باز لە سەر نیشتن ٢. فڕۆکە؛ بالافڕ ‹بەغدا ... بە هەزاران عەسکەر و جاشی کورد و عارەبی، بە تۆپ و تەیارە و زرێپۆشەوە نارده سەر پێشمەرگەی دەشتی هەولێر «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ⇐ ١. جای نشستن باز شکاری ٢. هواپیما

**تەیان / teyan/**: ناو. ١. کارەکەر؛ جێری؛ کلفەت؛ قەرەواش؛ خەدامە؛ ژنی خزمەتکار ٢. تیان؛ مەنجەڵی گەورەی حەمامی پێشوو ⇐ ١. کُلفَت؛ خدمتکار ٢. دیگ بزرگ حمامهای گذشته

**تەیجە / teyce/**: ناو. سەوەتە؛ قەرتاڵە؛ هەر دەفرێ لە توول تەنرابێ ⇐ سبد

**تەیچە / teyçe/**: ناو. تەیکە؛ تەینجە؛ سەلە؛ نانەشان ⇐ آبکش

**تەیر / teyr/**: ناو. ١. مەل؛ باڵدار؛ باڵندە ‹یادم نەمشی جە گردین حاڵدا/ چەنی باڵ تەیر یا وە شەماڵدا «مەولەوی»› ٢. تەیرەکوێرە؛ تەیرەنئەبابیل؛ تەڕنەبابیلە؛ پالوانە؛ پەڕەمەساسە؛ کاردەپەڵە؛ کاردەپلە؛ چەورۆکە؛ خەنجەرباڵ؛ شمشێرباڵ؛ حاجیڕەشک؛ تۆرەمەیێ لەو باڵندانە کە لە پەڕەسێلکە دەچن، لەشیان باریک و باڵیان درێژە و لە دەستەی داس دەچێ، کلک و قاچیان کورتە، بە پۆل دەژین و زۆر تیژباڵن ⇐ ١. پرنده ٢. بادخورک

**تەیروتوار / teyr û t(i)war/**: ناو. تەیروتواڵ؛ تەیروتواڵ؛ مەل؛ باڵدار؛ باڵندە؛ پەڕندە ‹تەیروتوارێکی زۆر لەو زەلکاوە کۆ بۆتەوە› ⇐ پرنده

**تەیروتواڵ / teyr û t(i)wal/**: ☜ **تەیروتوار**

**تەیروتواڵ / teyr û t(i)wał/**: ☜ **تەیروتوار**

**تەیر و تور / teyr û tûr/**: ناو. مەل و باڵندەی زۆر ‹هەر تەیر و توورە وەک من ئەخوێنن لە خۆشیا/ هەر باخەوانە ئارەزوویی هەڵپەڕین ئەکا «بێخود»› ⇐ پرندگان

**تەیرۆک / teyrok/**: ☜ **تەرزە**

**تەیرە / teyre/**: ناو. ڕێگر؛ تەریدە؛ چەتە ⇐ راهزن

**تەیرەحەوایلە / teyreĥewayle/**: ناو. پاڵەوانە؛ پالوانە؛ چەورووکە؛ باڵداسووکە؛ تەیرەکوێرە ⇐ بادخورک؛ پرستوی سیاه

**تەیرەکوێرە / teyrek(i)wêre/**: ☜ **تەیر-٢**

**تەیرەن‌ئەبابیل** / teyren'ebabîl/: ☜ **تەیر-٢**

**تەیرین** / teyrîn/: چاوگ. بێ‌هەست و خوست بوون ☰ بی‌حس شدن؛ تباسیدن

**تەیس** / teys/: ناو. بریقە؛ بریسکە ☰ درخشش

**تەیسا** / teysa/: سارستە. خۆزگە؛ خۆزگا؛ خۆزیا ☰ ای کاش

**تەیسان** / teysan/: ☜ **تەیسین**

**تەیساندن** / teysandin/: چاوگ. تroووسکاندنەوە ☰ درخشان کردن

**تەیسۆک** / teysok/: ناوەلناو. درەخشان؛ بەدرەوشە ☰ درخشان

**تەیسین** / teysîn/: چاوگ. تەیسان: ١. بریقانەوە؛ ترووسکانەوە ٢. ئایسان؛ گڕدار بوون ☰ ١. درخشیدن ٢. افروختن

**تەیڤەز** / teyvez/: ناوەلناو. تەیار؛ ساز؛ ئامادە ☰ آمادە

**تەیڤەزین** / teyvezîn/: چاوگ. ساز بوون؛ ئامادە بوون ☰ آمادە شدن

**تەیکە** / teyke/: ☜ **تەیچە**

**تەیلە** / teyle/: ناو. کۆڵ؛ تێلەکە ☰ پشتە

**تەیلەسان** / teylesan/: ☜ **تێلیسان**

**تەیمان** / teyman/: ناو. تامان؛ تان؛ تانە؛ تەجیر؛ چەپەر؛ دەرک و دیواری لە شووڵ ☰ پرچین

**تەینا** / teyna/: ☜ **تەنیا**

**تەینابالْ** / teynabał/: ☜ **تەنیابالْ**

**تەینجە** / teynce/: ☜ **تەیچە**

**تەیوانە** / teywane/: ناو. خۆراکێ لە ماڵی زاواوە بۆ ماڵی بووک دەبرێ ☰ غذایی کە از خانەی داماد بە خانەی عروس برند

**تەیەو** / teyew/: ناوەلناو. تەی؛ ڕام و فێرەکار ☰ رام شدە و کارآموختە

⊡ **تەیەو بوون**: ڕاهاتن و فێرەکار بوون ☰ رام شدن و کارآموختن

**تەیەوبوگ** / teyewbûg/: ناوەلناو. لە کەل دەرهاتوو؛ ڕاهێندراو بۆ کار ☰ رام شدە و پرورش یافتە

**تەیهو** / teyhû/: ناو. سوێسکە؛ تێ ☰ تیهو

**تهتاڤک** / tihtavik/: ناو. جاترە؛ نەعنەکێویلە ☰ نعنای کوهی

**تهتاوک** / tihtawik/: ناو. نەعناکێویلکە ☰ نعنای کوهی

**تهنوشک** / tihnwişk/: ناو. نەخۆشی گەروو؛ هەو کردن و کزەکزی ناو قوڕگ ☰ **التهاب گلو**

**تهنوی** / tihnûy/: ☜ **تینوویەتی**

**تهنویی** / tihnûyî/: ☜ **تینوویەتی**

**تی**[1] / tî/: ناو. ١. شووبرا؛ هێوەر؛ برای مێرد ٢. توو؛ تفی ٣. تیخە (شیر و خەنجەر و ...) ٤. تیل؛ سووچ؛ قوژبن ٥. تیشک ☰ ١. برادر شوهر ٢. توت ٣. تیغەی (شمشیر و کارد و ...) ٤. گوشە ٥. پرتو

**تی**[2]: ناوەلناو. ١. ☜ **تینو**[٢] ٢. بڵ؛ شل‌بوو (میوە) ٣. تەنگ؛ تەسک و تیوار ☰ ١. ☜ **تینو**[٢] ٢. آب آوردە (میوە) ٣. تنگ

**تی**[3]: جێناو. تۆ؛ ئەتۆ ☰ تو

**تیا**[1] / t(i)ya/: ناوەلناو. تەیا؛ سەرگەردان؛ ڕێ‌گوم‌کردوو ☰ سرگردان

**تیا**[2]: جێناو. تۆ؛ ئەتۆ (بۆ مێ) ☰ تو

**تیا**[3]: دەنگ. حەیف؛ ئۆی ☰ حیف

**تیا**[4]: ئامراز. تێدا؛ دەنێو؛ لە ناو ☰ در

**تیابردن** / t(i)yabirdin/: چاوگ. فەوتاندن؛ لە ناو بردن ☰ از میان بردن؛ نابود کردن

**تیابون** / t(i)yabûn/: چاوگ. تێدا بوون؛ خاڵی نەبوون ‹دێڕبەدێڕ کەشکۆڵ و دیوانی هەموو عالەم گەڕام/ تیانەبوو بێخود وەکوو من مونتەخەب فەردی گوناح «بێخود»› ☰ دربرداشتن

**تیاترۆ** / t(i)yatro/: ناو. ١. ☜ **تیاترۆخانە** ٢. شانۆیار؛ شانۆگەر؛ نیارڤان ☰ ١. ☜ **تیاترۆخانە** ٢.

هنرپیشەی تئاتر

**تیاترۆخانە** / t(i)yatroxane/: نـاو. تیـاترۆ؛ تەماشاخانەی سازندە و سەماکەران ⚏ تئاتر

**تیاچوون** / t(i)yaçûn/: چاوگ. ١. لـە نـاو چـوون؛ تێچوون؛ لە ئـارادا نـەمان ٢. مـردن ⚏ ١. از بـین رفتن ٢. مُردن

**تیاح** / t(i)yah/: دەنـگ. وشـەی سەرسـووڕمان ‹تیاح لەو فیلەتەنە!› ⚏ وه؛ کلمەی تعجب

**تیار** / t(i)yar/: ناوەلناو. زرینگ؛ زرنگ ⚏ زرنگ

**تیاڕامان** / t(i)yařaman/: چـاوگ. ١. واقوڕمـان؛ سەرسـووڕمان ٢. بـیر لـێکردنـەوە ⚏ ١. مُتحیّـر ماندن ٢. اندیشیدن

**تیامان** / t(i)yaman/: چاوگ. دامـان؛ مـات بـوون (لە کار یان ئاکامی کارێک) ⚏ درماندن

**تیان**[١] / t(i)yan/: ☜ **تیانە**

**تیان**[٢]: ناوەلناو. نە ڕاستەوخۆ؛ لە سووچ و کـەنارەوە ⚏ غیرمستقیم

**تیانچە** / t(i)yançe/: نـاو. پاتیلـە؛ قۆشـقانە؛ مەنجەڵی لە تیانە گچکەتر ⚏ دیگچە

**تیانە** / t(i)yane/: ناو. تیان؛ مەنجەڵـی گـەورەی گوشاد ⚏ دیگ

**تیبا** / tîba/: نـاو. تارمایی؛ ڕەشـایی لـە شـەودا ⚏ شَبَح

**تیپ** / tîp/: نـاو. ١. کۆمـەڵ؛ دەسـتە ‹دیـدە نیگەهبانی یار، تیپی سوروشـکم هـەزار/ نالـەیی دڵ نەیسەوار، ئاه عەلەمداری من! «نـالی»› ٢. ڕسـتە؛ جوملە ٣. یەکـەی چەکـداری، بریـەتی لـە ٢١٥ کەس ⚏ ١. گروه؛ دستە ٢. جملە ٣. تیپ

**تیت** / tît/: ناو. ١. ڕەنگی سووری ئاچخ ٢. زولـف؛ کەزی؛ پرچ ٣. تی؛ تـوو؛ تفـی ⚏ ١. رنـگ سـرخ روشن ٢. گیسو ٣. توت

**تیتاڵ** / tîtał/: نـاو. ١. شـۆخی؛ حەنـەک؛ قسـەی گاڵـتە ٢. ئـاینوئـۆین ٣. بوختـان؛ تۆمـەت ٤. شیتاڵ؛ کوتەپەڕۆ ⚏ ١. لطیفه؛ شوخی ٢. ادا و اطوار ٣. بُهتان ٤. تکه پارچه

**تیتاڵباز** / tîtałbaz/: ناوەلـناو. ١. قسـەخۆش؛ گاڵتەچی ٢. نازونووزکەر؛ بەئاینوئۆین ⚏ ١. لَودە ٢. اطواری

**تیتاڵی** / tîtałî/: ناو. ١. جەفەنگبازی ٢. مەکربازی ٣. شۆخی؛ گاڵتە؛ حەنەک؛ قسەی پێکـەنینی ٤. گاڵتە؛ کازە؛ گوندەڵ؛ تەتەڵـەمیران؛ ئاکـاری بـە گـەپ و گاڵـتە دەگـەڵ کەسـێکدا ‹تیتاڵـیم پـێ ئەکەی؟›. هەروەها: **تیتاڵی کـردن** ⚏ ١. لـودگی ٢. حیلەگری ٣. شوخی ٤. مسخره

**تیتانیوم** / tîtanyum/: ناو. تـوخمی کـانزایی، بـە ژمارەی ئەتومی ٢٢ و کێشی ئەتومی ٤٧,٨٨، بـە ڕەنگی خۆڵەمێشی زێوی، کە کانزایـەکی نـەرم و سووکە و بە شێوەی تێکەڵ لە سروشتدا هەیـە و لە دروست کردنی ئالیاژگەلدا کەڵکی لێ دەگـرن ⚏ تیتانیُم

**تیتڕواز** / tîtirwaz/: نـاو. تیتـڕواس؛ تیترواسـک؛ تیتلـەپیچاخ؛ مەلێکـە لـە بیچمـی چۆلەکـە ⚏ پرندەای شبیه گنجشک

**تیتڕواس** / tîtirwas/: ☜ **تیتڕواز**

**تیتڕواسک** / tîtirwask/: ☜ **تیتڕواز**

**تیتک** / tîtik/: نـاو. ١. خشلـێکی تـوێڵ ٢. تیـت؛ بسـک و پەرچـەم ٣. میمـک؛ میمـی؛ پـوور؛ خوشـکی بـاوک ٤. ئـەنیبەنـدی زارۆک ٥. تووتکەسەگ ٦. بەلۆکە؛ میتکـەی مێوینـە ⚏ ١. زیور پیشانی ٢. زلف؛ عُذار ٣. عمّه ٤. پیشانیبند نـوزاد ٥. تولەسگ ٦. چچوله

**تیتکزا** / tîtikza/: نـاو. تیتکـەزاد: ١. میمکـەزا؛ پوورزا؛ فرزەندی خوشکی بـاوک ٢. *[پلار، کینایە]* خزمـی نابـاب و نـەگونجاو ⚏ ١. عمّـەزادە ٢. خویشاوند ناباب

**تیتکەزاد** / tîtkezad/: ☜ **تیتکزا**

**تیتگ / tîtig/:** ☜ **توتك ـ١**

**تیتگەشوانە / tît(i)geş(i)wane/:** ناو. پیرۆشک؛ خلێرە ☰ خرخاکی

**تیتل / tîtil/:** ناو. بێچووی چکۆلووکە ☰ بچەی کوچولو

**تیتل و بیبل / tîtil û bîbil/:** ناو. ١. دوو کارژۆڵەی نێو چیرۆکی کۆنی منداڵان ٢. *[کینایە]* دوو یان چەند بێچووی چکۆلانەی ڕەزاسووک ☰ ١. شنگول و منگول؛ دو بزغالە در قصەی کودکان ٢. بچە کوچولوهای دوستداشتنی

**تیتلەپیچاخ / tîtlepîçax/:** ☜ **تیترواز**

**تیتلیسک / tîtlîsk/:** ناو. گیایەکە لە ئاودا دەڕوێ ☰ گیاهی آبزی

**تیتن / tîtin/:** ناو. ١. پلپلە و لەرزانە ٢. ☜ **توتن** ☰ ١. زیوری است ٢. ☜ **توتن**

**تیتۆک / tîtok/:** ناو. شێلم؛ شەلەم؛ گیایەکە بنکی خڕە، لە تیرەی چەوەندەر ☰ شلغم

**تیتۆڵ / tîtoł/:** ناو. شڕەی پارچە؛ تیسماڵک لە کووتاڵی دڕاو ☰ کُهنه

**تیتۆڵ ـ تیتۆڵ / tîtoł tîtoł/:** ئاوەڵناو. شڕ و دڕ ‹بە کەلاوە، بە کوندەبوو، بە دیواری هەرەس هێناو/ بە داوێنی تیتۆڵ ـ تیتۆڵ، بە ئانیشکی پینەکراو «هێمن»› ☰ کهنەپارە

**تیتو / tîtû/:** ☜ **توتو**

**تیتە / tîte/:** ناو. ١. تیتک؛ خشڵی تەوێڵ ‹سەرچۆپی وە ناز خول هۆردای دەسماڵ/ بریکەی تیتە و لەرەی لیمۆی کاڵ «مەولەوی»› ٢. بەڕوولە خەیار ☰ ١. زیور پیشانی ٢. خیار کوچک

**تیتەکۆڵە / tîtekołe/:** ☜ **توتەکۆڵە**

**تیتی[1] / tîtî/:** ناو. ١. کولێرەی لە شکڵی پەڕندە بۆ منالان ٢. تیتک؛ میمک ☰ ١. گردە نان بە شکل پرندە برای بچەها ٢. عمّە

**تیتی[2]:** دەنگ. دەنگی بانگ کردنی مریشک و کاژێلە ☰ صوتی برای خواندن ماکیان و بُزغالە

**تیجی / tîcî/:** ☜ **تیشك**

**تیچ / tîç/:** ناو. بڵاوی و بێسەروبەرەیی ☰ پراکندگی؛ پریشانی

**تیچان / tîçan/:** چاوگ. بڵاو بوونەوە؛ شپرزان ☰ پراکندە شدن

**تیخ / tîx/:** ناو. تێغ: ١. دەمەچەقۆ و شیر و خەنجەر و ... ٢. تێغی ڕیش تاشین ☰ ١. لبەی کارد و چاقو و ... ٢. تیغ

**تیخل / tîxil/:** ☜ **توێکڵ**

**تیخوڵ / tîxuł/:** ☜ **توێکڵ**

**تیخە / tîxe/:** ☜ **تیغە**

⊡ **تیخە کردن:** تیغە/ تێخە کردن؛ دانانی دیوارێکی تەسک لە نێوان دوو هۆدە ☰ تیغە کردن

**تیر[1] / tîr/:** ناو. ١. ئەوی بە کەوان دەیهاوێن ٢. فیشەک؛ گوللە ٣. دار و تیراسنی سەر گرتنی خانووبەرە ☰ ١. تیر کمان ٢. گلولە ٣. تیرِ سقف

⊡ **تیری تانە:** *[مەجاز]* ئێشی تیژی تانە هاویشتن ‹من مەنم ئەڕای جەفای زەمانە/ پیر تیر تانەی خێش و بیگانە «شامی»› ☰ آماج طعنە و نکوهش

**تیری نەبەدی:** گوللەی وێڵ؛ تیری بێ ئامانج ☰ تیر بی هدف شلیک‌شده

**تیر[2]:** ئاوەڵناو. خەست؛ خەس؛ هەس ☰ غلیظ

**تیرئاسن / tîr'asin/:** ناو. تیراسن؛ شاخە ئاسنێک بە ئەستووری لای کەم ٦ سانت لە بیچمی H یا L، بۆ کردنەوەی خانووبەرە ☰ تیرآهن

**تیرئەستێرە / tîr'estêre/:** ناو. شۆڵە؛ نێزەک ☰ شهاب

**تیرئەناز / tîr'enaz/:** ناو. تیرئەنداز؛ تیرهاوێژ؛ کەسێ کە تیر لە کەوان یان بە تفەنگ دەهاوێ ☰ تیرانداز

**تیرئـــەنازی** / tîr'enazî/: نـــاو. تیرئەنـــدازی؛ تیرهـــاوێژی؛ کـــار و ڕەوتی تـــیر هاویشـــتن 🇮🇷 تیراندازی

**تیرئەنداز** / tîr'endaz/: ☜ **تیرئەناز**

**تیرئەندازی** / tîr'endazî/: ☜ **تیرئەنازی**

**تیراژ** / tîraj/: ناو. ژمارە؛ ئەژمار؛ ژماری چاپکراوی دەقێکی چاپی 🇮🇷 تیراژ

**تیراسن** / tîrasin/: ☜ **تیرئاسن**

**تیرانگ** / tîrang/: ناو. مسولدان؛ میزدان 🇮🇷 مثانە

**تیـراوێ** / tîrawê/: نـاو. برینــارەش؛ ســیازام؛ کوانەڕەشە؛ لاڕەشـە؛ ڕەشـەکەوتە؛ ڕەشـەبرین؛ ڕەشـەزام؛ برینـارەش؛ قـەرەقوش؛ نەخوشـی چلکی هاوبەشی مرۆڤ و ئاژەڵ کە بـە شـێوەی کوانێکی چلکینی نـاوڕەش سـەر هەڵـدەدا کـە کوانێکی زۆر تووشە و چا بوونـەوەی حەسـتەمە 🇮🇷 سیاەزخم

**تیـراوێدار** / tîrawêdar/: ناوەڵـناو. تووشـیاری تیراوێ 🇮🇷 مبتلا بە سیاەزخم

**تیراوێژ** / tîrawêj/: ناو. بـەرپێک؛ مەودایـەک کـە تیری هاوێژراوی دەگاتێ 🇮🇷 تیررس

**تیربـار** / tîrbar/: نـاو. جۆرێـک چـەک، لەسـەر سێپایە دەوەستێ و گوللەکەی لە ٤٠ میلیمیتـر گەورەترە 🇮🇷 تیربار

**تیربـاران** / tîrbaran/: نـاو. تیرەبـاران: ١. گوللەباران؛ کارەڕەهاتی کوشتن بە گەلەکۆمەی تیر هاوێژان ٢. کـار و ڕەوتی وێکـڕا هاویشـتن یان هاوێژرانی تیری زۆر 🇮🇷 ١. تیرباران ٢. حالـت فروریختن تیرهای بسیار و متوالی از هر طرف

**تیربیوم** / tîrb(i)yum/: ناو. تـوخمی کـانزایی لـە دەستەی لانتانیدەکان بە ژمـارەی ئـەتومی ٦٥ و کێشی ئەتومی ١٥٨,٩٢وە 🇮🇷 تربیُم

**تیرتیـرک** / tîrtîrik/: نـاو. شیرشـیرە؛ جرجـرە؛ سیسرک 🇮🇷 جیرجیرک

**تیرچـە** / tîrçe/: نـاو. تیرەکلـێ؛ دەسـتەکێ؛ ئالوودار؛ ڕاچە؛ باهوو؛ تیری کول و کۆتا لە چێو، ئاسن یان بیتون بۆ کاری مـاڵ کردنـەوە و... 🇮🇷 تیرچە

**تیرچەبلـوک** / tîrçeb(i)lûk/: نـاو. تیرچـەی پۆلایین و خشتی سیمنتۆ بـۆ میچـی خـانوو 🇮🇷 تیرچەبلوک

**تیردار** / tîrdar/: ناو. ئاموور؛ هەوجار 🇮🇷 خیش

**تیردان** / tîrdan/: ناو. هەگبـەی تـیران؛ جێگـەی تیرەکەوان 🇮🇷 تیردان

**تیرفڕنگ** / tîrf(i)ř̌ing/: ناو. پلتۆک؛ پەلەپیتکە 🇮🇷 تلنگُر

**تیرک** / tîrik/: ناو. تیرەک؛ ئالـوودار؛ دارەڕایەڵـی میچ 🇮🇷 تیر سقف

**تیرکەوان** / tîrkewan/: ☜ **تیر و کەوان**

**تیرنج** / têrinc/: ناو. تێـرنج؛ پـەراوێزی بـەرگ و شمەک؛ کەنارەی جبە و کراس 🇮🇷 سجاف

**تیر و پشک** / tîr û pişk/: ناو. کاری پشک خستن 🇮🇷 قرعەکشی

**تیر و تانە** / tîr û tane/: ناو. تانە و تەشـەر ‹ئـەو کەسـەی دووری عـەزیزانی نـەدی/ تـیر و تانـەی بێتەمیزانی نەدی «هێمن»› 🇮🇷 طعن و لعن

**تیر و چەقەڵ** / tîr û çeqel/: ناو. جۆرێ خێشـک بۆ گواسـتنەوەی شـتی قـورس کـە گـا یـا وڵاخ ڕایدەکێشێ 🇮🇷 نوعی سورتمە برای جابجایی وسایل سنگین

**تیـر و کـەوان** / tîr û kewan/: نـاو. تیرکـەوان ‹چەکی ئەو حەلە تـیر و کەوانـە/ لـە لای هەیکەلـدا دیارە نیشانە «قانع»› 🇮🇷 تیر و کمان

**تیـروێ** / tîrwê/: نـاو. داری تێـروو 🇮🇷 درختچـەای جنگلی

**تیـرۆر** / tîror/: نـاو. ڕەشـکوژی؛ ڕەشـەکوژی؛ تەریەگەری؛ کاری پەنامـەکی و بـە دزییـەوە بـۆ

کوشتنی کەس یان کەسانێک ■ ترور

**تیرۆریست** / tîrorîst/: ناو/ ئاوەڵناو. ڕەشکوژ؛ کاربەدەستی تیرۆر یان بڕوادار بە وا کارێک ■ تروریست

**تیرۆریسم** / tîrorîsm/: ناو. ڕەشکوژی؛ کەڵک وەرگرتن لە تیرۆر وەک ڕێبازێک بۆ دەستکەوتنی ئامانج ■ تروریسم

**تیرۆژ** / tîroj/: ناو. تیرەژ؛ تیرێژ؛ تیشک (خۆر) ■ روشنایی (آفتاب)

**تیرۆژک** / tîrojik/: ناو. تیشک ■ نور

**تیرۆژو** / tîrojû/: ناو. بالا؛ هەوالی تیریژ/ تیرنج؛ پارچەی درێژووکەی کراسی ژنان ■ قطعه پارچەی بلند پیراهن زنانه

**تیرۆک** / tîrok/: ناو. داروو کەیەکی خەڕاتی کراو بۆ ئەنگووتک پان کردنەوە ‹زەمانەی پرتەعەب دەتکاتە تیرۆک/ لەتێ نانت دەداتێ دوو بەشی نۆک «مەحوی»› ■ نورد

**تیرو** / tîrû/: ناو. چەقەڵ ■ شغال

**تیرە** / tîre/: ناو. ١. تایەفە؛ بەشێک لە هۆز ‹تیرە و ڕەگەزی کوردی کوردستان/ ئەوەندە زۆرن نایەنە بەیان «قانع»› ٢. تەختەیەک لە مەرەزە ٣. سیرمە چەرمی باریک بۆ بن کلاش ‹وەک کلاشی سۆفی لەڕ/ کاتێ تیرەی دێتە دەر «قانع»› ٤. شانە هەنگوینی لە سەر لا داندراو ٥. *[ژیناسی]* بەشێ لە گیانەوەران یان گیاگەلی خاوەن چەند تایبەتمەندی یەکجۆر ■ ١. تیره؛ طایفه ٢. کَردی از شالیزار ٣. تسمەی چرمی کە در کفش دستدوز (کلاش) بە کار می‌برند ۴. شانەی عسل چیده شده ۵. تیره (زیستشناسی)

**تیرەباران** / tîrebaran/: ☜ **تیرباران**

**تیرەژ** / tîrej/: ☜ **تیرۆژ**

**تیرەشان** / tîreşan/: ناو. ١. شانەهەنگوین ٢. گردەشان؛ لاپاڵی کێو ‹بە تیرەشانەکەدا داگەڕاین› ■ ١. شانەی عسل ٢. سینەکش کوه

**تیرەغە** / tîreğe/: ناو. مۆغەرە؛ مازەپشت ■ ستون فقرات

**تیرەک** / tîrek/: ☜ **تیرك**

**تیرەکڵێ** / tîrek(i)łê/: ☜ **تیرچە**

**تیرەگ** / tîreg/: ناو. یاڵ؛ تەپە ■ تپه

**تیرەگە** / tîrege/: ناو. بەرزترین جێگای بەرزاییەک ■ خطالرأس؛ تیزه

**تیرەگەشان** / tîregeşan/: ناو. ملەی کێو ■ گردنەی کوه

**تیرەمار** / tîremar/: ناو. جۆرێ ماری باریک ■ نوعی مار باریک

**تیرەنان** / tîrenan/: ناو. شەوبەک؛ وەردێنە؛ کرتناک ■ وردنه

**تیرهاوێ** / tîrhawê/: ناو. تیراوێ؛ سیچڕ؛ سیخوڕ ■ خارپُشت

**تیرهاوێژ** / tîrhawêj/: ☜ **تیرنەناز**

**تیرهاوێژی** / tîrhawêjî/: ☜ **تیرنەنازی**

**تیری**[1] / tîrî/: ناو. خەستی؛ خەسی؛ هەسی؛ دژی شلی ■ غلظت

**تیری**[2]: ئاوەڵناو. تەنکی تەندوور (نان) ‹نانی تیری› ■ نازک (نان)

**تیریژ** / tîrîj/: ناو. تیرنج؛ گرۆڵ؛ سێ سووچێک لە پەراوێزی کراسدا ■ تکه پارچەی مثلثی در حاشیەی پیراهن زنانه

**تیریلێدەر** / tîrîlêder/: ناو. وەردێنەچی ■ نوردەچی نانوایی

**تیرێژ** / tîrêj/: ناو. تیرۆژ؛ تیشک (خۆر) ‹تیرێژ کە بە ڕۆژ و پێل بە دەریا دریا/ لەو ڕۆژەوە گوڵ پێکەنی، بولبول گریا «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ■ روشنایی (آفتاب)

**تیرێن** / tîrên/: ناو. کرمێنا؛ جۆرێک کایەی منداڵانە بە هەڵمات دەکرێ ■ نوعی تیلەبازی

**تیڕ / tîř/**: ناو. ↓

⊡ **تیڕ تماشا کردن**: لار تماشا کردن ☰ چپ چپ نگاه کردن

**تیڕ لێبردنەوە**: لار لێ ڕوانین ☰ چپ چپ به کسی نگاه کردن

**تیڕتیـڕە / tîřtîře/**: نـاو. زەردەقـوڕە؛ جـۆرێ مارمێلکـەی ئەسـتوور و دریـژە، ڕەنگـی خـۆی دەگـۆڕێ و بـە ڕەنگـی دەوروبـەری دەردێ ☰ آفتاب‌پرست

**تیز / tîz/**: ناو. ١. کووزەڵە؛ کووز؛ گیایـەکی تیـژە لە ئاودا دەڕوێ ٢. ڕشخەن؛ گاڵتە ٣. جـووز؛ بـز؛ کلکەبزێ ☰ ١. شاهی آبی ٢. ریشخند ٣. انگُلک

⊡ **تیز پێکردن**: گاڵتە پێ‌کردن ☰ مسخره کردن

**تیز پێوەکردن**: سووک/ جووز/ بز پێـوەکردن ☰ انگُلک کردن

**تیزاب / tîzab/**: ناو. تیزاو؛ ترش؛ ئەسید ☰ اسید

**تیزانـدن / tîzandin/**: چـاوگ. هەڵـتۆزاندن؛ هەڵـهاتن و لەپـڕ دەرچـوونی حـەیوانی بـەرزە، بەتایبەت کەر، بە لووشکە خسـتن و زەڕەزەڕەوە ☰ رمیدن و جفتک پراندن بویژە الاغ

**تیزانگ / tîzang/**: ناو. ١. موسوڵدان؛ میزەڵدان ٢. پزدان؛ زێدان ٣. کیسەی لاستیکی کە فووی تێ دەکەن بۆ منداڵان ☰ ١. مثانه ٢. زهدان ٣. بادکُنک

**تیزاو / tîzaw/**: ☜ تیزاب

**تیزماڵ / tîzmał/**: ☜ تیزماڵك

**تیزماڵـک / tîzmałik/**: نـاو. تیزمـاڵ؛ تیسماڵـک؛ تیلماسک؛ ترمسک؛ ترماسک؛ تیلمە؛ شریتە پەڕۆ ☰ نوار پارچه‌ای

**تیزوفیـز / tîz û fîz/**: نـاو. ئەسـتوونی یەکتربـڕ؛ نیشانەی زەرب ☰ علامت ضرب

**تیزۆ / tîzo/**: ئاوەڵـناو. سڵ‌وقەڵـس؛ هەڵـتۆزێن ☰ پرخاشگر

**تیژ[١] / tîj/**: ئاوەڵناو. تیژ؛ تـیش: ١. تـوون؛ تونـدی زمان‌سـووتێن ٢. بەبڕشـت ‹نـووکی موژگـانی لـە خەنجەر تیژترە بۆ قەتڵی من/ چۆن بە جارێ تف لـە شیر و خەنجەر و نەشتەر نەکەم «قانع»› ٣. توند لە کار و ڕۆیشتن ٤. *[مەجاز]* پێداگر؛ سوور؛ شـێلگیر ☰ ١. تُند ٢. بُرّنده؛ تیز ٣. چابک ۴. مُصر

⊡ **تیژ بوون**: ١. کول نەبوون ٢. *[مەجاز]* پـێداگـر بوون؛ سوور بوون لە سەر کـار ☰ ١. تیـز و بُـرّا بودن ٢. مُصر بودن

**تیژ بوونەوە**: ١. دیسانەوە تیـژ بـوون ٢. *[مەجاز]* سوور بوون لە سەر کارێ ☰ ١. دوباره تیز شـدن ٢. پافشاری کردن

**تیژ کردن**: ١. ساوین و لە چـەرخ دانی تـیخ ٢. *[مەجاز]* دنەدان؛ هەڵخڕاندن ☰ ١. تیـز کـردن ٢. تحریک کردن

**تیژ کردنەوە**: ١. دیسانەوە تیژ کردن ٢. *[مەجاز]* هەڵخڕاندن ☰ ١. دوباره تیـز کـردن ٢. تحریـک کردن

**تیژ[٢]**: ئاوەڵکار. تیش؛ گورج؛ زوو ‹تیژ بڕۆ تیر بێرەوە! «مەسەل»› ☰ سریع

**تیژاو[١] / tîjaw/**: نـاو. تیژاو؛ تیـزاب: ١. ئـاوی دۆی کوڵاو ٢. ترش؛ ئەسید ☰ ١. تیزاب؛ پسماندەی دوغ جوشیده ٢. اسید

**تیژاو[٢]**: ئاوەڵناو. تیژاو؛ مەزبووت و بەکار ☰ چالاک

**تیژباڵ / tîjbał/**: ئاوەڵناو. خێرا لە فڕیندا ☰ تیزبال

**تیژبیر / tîjbîr/**: ئاوەڵناو. بیرتیژ؛ وریـا؛ زیـرەک ☰ باهوش

**تیژپەڕ / tîjpeř/**: ئاوەڵـناو. تایبەتمەندی نێرینـەیێ کـە زۆر دەپـەڕێت ☰ ویژگـی نرینـه‌ای کـه زیـاد جفتگیری می‌کند

**تیژڕۆ / tîjřo/**: ئاوەڵـناو. خـۆش‌ئـاژۆ؛ خۆشـبەز ☰ بادپا

**تیژڕەو / tîjřew/**: ئاوەڵناو. خۆشبەز؛ بەپا؛ خۆشـڕەو ☰ بادپا

**تیژك** / tîjik/: ناو. تیشكی تاو؛ خۆرەتاو 🇮🇷 اشعەی آفتاب

**تیژكەڵە** / tîjkeḷe/: ئاوەڵناو. بەژن‌باریک؛ قەدباریک 🇮🇷 کمرباریک

**تیژگ** / tîjig/: ناو. تیشک؛ تیژک ‹منیش لەمەو پاش وایە بڕیارم/ تیژگی خۆر بێ لام نازخەندەی یارم «گۆران»› 🇮🇷 پرتو

**تیژمار** / tîjmar/: ناو. بازقەپان؛ باسقەپان 🇮🇷 نوعی مار زردرنگ

**تیژە** / tîje/: ناو. نانەشان؛ تەینجە؛ سەلەی پالاوتنی برنج و ساوار 🇮🇷 آبکش

**تیژەباڵ** / tîjebaḷ/: ئاوەڵناو. فڕۆک؛ فڕا 🇮🇷 تیزپر

**تیژەڤان** / tîjevan/: ئاوەڵناو. هەڵخڕێن؛ دنەدەر؛ هانەدەر 🇮🇷 تحریک‌کننده

**تیژەمار** / tîjemar/: ناو. ماری خێرا 🇮🇷 مار سریع

**تیژهەست** / tîjhest/: ئاوەڵناو. هەستۆک؛ سانتیمانتاڵ 🇮🇷 احساسی

**تیژی** / tîjî/: ناو. تیژی: ١. چۆنیەتی بەبڕشت بوون ٢. تامی توند؛ چێژەی زمان‌سووتێن 🇮🇷 ١. بُرَندگی؛ تیزی ٢. تُندی (مزه)

**تیس** / tîs/: ناو. ١. ☜ **تۆسی** ٢. سواپ؛ بەردی چکۆلەی پان و لووس و تەنک 🇮🇷 ١. ☜ **تۆسی** ٢. شن پهن و صاف و نازک

**تیسقوفلاسق** / tîsq û f(i)lasq/: ناو. بەرگی شەڕکەر و ڕاوچی 🇮🇷 ساز و برگ جنگجو و شکارچی

**تیسک** / tîsk/: ناو. ١. چەپکێکی پچووک لە کولکە و موو ٢. موو یان خوری درێژ ٣. تلک؛ تلسک؛ تلیسک؛ تلماسک؛ تەلسک؛ تەلمسک؛ تیسکە؛ زەنگەتە ترێ؛ هێشووی پچووک لە هێشووی گەورە 🇮🇷 ١. دستەی کوچک از کُرک و مو ٢. مو یا پشم دراز ٣. تلسک انگور

**تیسکدرێژ** / tîskd(i)rêj/: ئاوەڵناو. بەتیسک؛ تیسکن؛ بەخوری 🇮🇷 پشمالو

**تیسکن** / tîskin/: ئاوەڵناو. کولکن؛ تووسکن؛ زۆر بەموو 🇮🇷 پشمالو؛ پُرمو

**تیسکۆ** / tîsko/: ئاوەڵناو. تیسکن؛ کولکن 🇮🇷 پشمالو

**تیسکە** / tîske/: ☜ **تیسك ـ٣**

**تیسماڵک** / tîsmaḷik/: ☜ **تیزماڵك**

**تیسوێ** / tîswê/: ☜ **تۆسی**

**تیش**[١] / tîş/: ناو. ١. بەردی بلندی ڕاست و لووس و هەڵچوو لە چیادا ‹تیشەشاخ› ٢. چووی پەل؛ جگی لووس‌کراو؛ میچی سواو 🇮🇷 ١. صخرەی صاف و مرتفع ٢. شتالنگ صاف شده

**تیش**[٢]: ☜ **تیژ**

**تیشتیر** / tîştîr/: ☜ **توشتیر**

**تیشك** / tîşk/: ناو. ١. پریسکە؛ پرشنگ؛ تیش؛ تیشکە؛ تیژک؛ تیجی؛ تی: *ئا)* تیژ؛ تریژ؛ تیرەژ؛ لیسک؛ بەشک؛ کووزە؛ لیزگ؛ هێڵێکی باریک لە ڕووناکی *ب)* ڕووناکی ٢. تیشکە؛ بریقە ٣. تیسک؛ کولکە و مووی درێژ 🇮🇷 ١. *الف)* شعاع پرتو *ب)* روشنایی ٢. انعکاس نور ٣. پشم و موی زیاد

⊡ **تیشك خستن:** ڕووناهی خستن (بە سەر شتێکدا) 🇮🇷 پرتو افکندن

**تیشك دانەوە:** شەوق دانەوە 🇮🇷 پرتو افشاندن

**تیشكباران** / tîşkbaran/: ئاوەڵناو. نووربااران؛ نووروااران 🇮🇷 نورباران

**تیشكدەر** / tîşkder/: ئاوەڵناو. تیشکزا؛ ڕادیۆئەکتیف؛ بە تایبەتمەندی یان هێزی تیشک‌دانەوەوە 🇮🇷 پرتوزا؛ رادیواکتیو

**تیشكدەرەوە** / tîşkderewe/: ئاوەڵناو. فلوریسێنت 🇮🇷 فلورسنت

**تیشكدەری** / tîşkderî/: ناو. تیشکزایی؛ ڕادیۆئەکتیفیتە؛ تایبەتمەندی بڕێک لە توخمەکان (وەک ئۆرانیوم) کە لە خۆیانەوە تیشک بلاو دەکەنەوە 🇮🇷 پرتوزایی؛ رادیواکتیویته

**تیشكزا** / tîşkza/: ئاوەڵناو. تیشکدەر؛ ڕادیۆئەکتیف

≚ رادیواکتیو

**تیشکزایی** / tîşkzayî/: ☜ **تیشکدەری**

**تیشکناس** / tîşknas/: ناو. ڕادیۆلۆجیست؛ پسپۆڕی ڕادیۆلۆژی ≚ رادیولژیست

**تیشکه** / tîşke/: ☜ **تیشك ـ۱و۲**

**تیشکەڵه** / tîşkełe/: ناوەڵناو. قەدباریک و لەبار ≚ باریک‌اندام

**تیشکهاوێژ** / tîşkhawêj/: ناوەڵناو. پرشنگدار؛ خاوەن‌پرشنگ ≚ تابان؛ پرتوافکن

**تیشه** / tîşe/: ناو. ۱. ☜ **تۆشه** ۲. ڕەگی تازە ڕواوی دەغڵ ≚ ۱. ☜ **تۆشه** ۲. جوانەی تازەی گیاه

**تیشەبڕ** / tîşebiř/: ناوەڵناو. تایبەتمەندی شەختەیێ کە دەخلی شین هەڵدەتەکێنێ ≚ ویژگی یخبندانی که ساقه‌های سبز را می‌خشکاند

**تیشەبەرد** / tîşeberd/: ناو. بەردی گەورە و لووس ≚ صخره‌ی صاف

**تیشەشاخ** / tîşeşax/: ناو. تیشەبەردی کێو؛ کەڤری حولی و بڵند لە چیا ≚ صخره‌ی صاف و مُرتفع

**تیشەڵان** / tîşełan/: ناو. بەردەڵانی سەخت ≚ سنگلاخ دشوارگذر

**تیشەمب** / tîşemb/: ناو. شاتوو؛ گاتوو؛ تووی ڕەش ≚ شاه‌توت

**تیشیا** / tîşya/: ناو. دەمەترشته؛ تۆڵاشه ≚ تراشه‌ی چوب

**تیشیر** / tîşîr/: ناوەڵناو. شیلەتێن؛ شیرتین؛ شیلە و گەرم؛ شیرەگەرم؛ نیوە سارد و گەرم ≚ ولرم

**تیغ** / tîğ/: ناو. تێغ؛ دەمە کێرد و شیر و خەنجەر ≚ تیغ

**تیغه** / tîğe/: ناو. تێخه؛ تیخه؛ تێغه؛ قولهه؛ دیواری تەنکی نێوانکەر ≚ تیغه

**تیغەشان** / tîğeşan/: ناو. ۱. ملەی کێو ۲. لاشانی چیا ≚ ۱. ستیغ کوه ۲. تیغه‌ی کوه

**تیف**[1] / tîf/: ناو. ۱. تنۆکە ئاو ۲. دەنکە باران ≚ ۱. قطره‌ی آب ۲. دانه‌ی باران

**تیف**[2]: ناوەڵناو. لووس و لەبار و ڕێک و لەبەرچاو ≚ شیک

**تیفتیفه** / tîftîfe/: ناو. تیوتیوه: ۱. کاری بریقه لێ خستن ‹سەرم تیف‌تیفه بده!› ۲. کاری خۆ جوان و لووس کردن ‹لاجانگت وەکوو گزنگی تاوێ/ هەر بۆخۆی جوانه، تیف‌تیفەی ناوێ «هێمن»› ≚ ۱. کار برق انداختن ۲. آرایش

⊡ **تیفتیفه دان**: تیوتیوه دان: ۱. بریقه لێ خستن ۲. خۆ جوان و لووس کردن ≚ ۱. برق انداختن ۲. آراستن

**تیفرنجگ** / tîfrincig/: ناو. پلتۆک؛ پەلەپیتکە ≚ تلنگُر

**تیفشاڵ** / tîfşał/: ☜ **تویژاڵ**

**تیفیک** / tîfîk/: ناو. کوورەی ئاسنگەر؛ دەمەی ئاسنگر ≚ کوره‌ی آهنگری

**تیڤ** / tîv/: دەنگەناو. گیزە؛ دەنگی تێپەڕینی گوللەی هاوێژراو ≚ صدای عبور گلوله

**تیڤرگ** / tîvirg/: ناو. چۆڕەپۆپنه؛ چوێلەکەیەکی کاکۆڵ‌بەسەر ≚ شانه‌بەسر

**تیڤسی** / tivsî/: ناو. دیس؛ بەلەمی چێشت؛ دەفری گراران؛ دەوری درێژووکەی گەورە ≚ دیس

**تیڤل**[1] / tîvil/: ناو. ۱. پلار؛ تیز؛ قسەی بەتێکول ۲. ☜ **تویکڵ** ≚ ۱. تعریض؛ حرف کنایه‌آمیز ۲. ☜ **تویکڵ**

**تیڤل**[2]: ناوەڵناو. هیچ‌وپووچ؛ بێ‌نرخ ≚ بی‌ارزش

**تیڤۆک** / tîvok/: ناو. چێشکه؛ چۆلەکه؛ مەلیچک؛ پاساری ≚ گُنجشک

**تیقاوڵه** / tîqawłe/: ناو. بلۆق؛ پۆڕگ؛ تۆقلە ≚ تاول

**تیقه** / tîqe/: دەنگەناو. تریقه؛ دەنگی خەنین ≚

هڕـ هڕ؛ صدای خنده

**تیقەل** / tîqel/: ئاوەڵناو. ڕزیوی دڕاو ≡ ژنده

**تیقەلۆ** / tîqelo/: ئاوەڵناو. جڵ‌شڕ؛ شڕۆڵ؛ بەرگ‌دڕاو ≡ ژنده‌پوش

**تیک** / tîk/: ناو. ١. تەقەڵ؛ باخیە ٢. کاری دروومان؛ دروون ٣. تیشە شاخ ٤. درز؛ قەڵش ٥. بریسک؛ بروسکە؛ تەزووی بەژان ٦. میتکە؛ بەلۆکە ≡ ١. بخیه ٢. دوخت ٣. صخره‌ی صاف و مرتفع ۴. درز؛ شکاف ۵. حالت تیر کشیدن ۶ چوچوله

**تیکان** / tîkan/: ناو. دڕک؛ دڕوو؛ چقڵ؛ دڕکی دار ≡ خار

**تیکلە** / tîkle/: ناو. ١. کیتەڵە؛ مەنجەڵۆکە؛ بەرۆشی پچووک ٢. جەڕەی ئاو کێشان ٣. دەفرێکی - زۆرتر بچووکی - خڕکەڵەی ڕۆحین ٤. *[پلار]* مرۆی کورتەباڵای قەڵەو ≡ ١. دیگ مسی کوچک ٢. سبوی آبکشی ٣. ظرف گرد از جنس روی ۴. آدم قدکوتاه فربه

**تیکڵ** / tîkił/: ئاوەڵناو. نەدی‌بدی؛ نەدی‌وبدی؛ نەیبی ≡ ندیدبدید

**تیکمە**[1] / tîkme/: ناو. دوگمە؛ تۆکمە؛ قوپچە ≡ دُکمه

**تیکمە**[2]: ☜ **تۆکمە**

**تیکنیتیوم** / tîknîtyum/: ناو. توخمی کانزای بەدەگمەنی ڕادیۆئەکتیڤ، بە ژمارەی ئەتومی ٤٣ و کێشی ئەتومی ٩٨,٩٠، بە ڕەنگی خۆڵەمێشی و ڕوویەکی زێوی،کە لە تەقینەوە ئورانیوم بەرهەم دێت ≡ تکتنیم

**تیکە** / tîke/: ناو. ١. لەت؛ پارچە لە شتێک ‹تا سەر مانگ بای دو تیکە ئەسپەو/ یا بەم فرووشم یا نەمە گرەو «شامی»› ٢. بابۆڵە؛ لەففە ‹ئەمانە هێزی گیانن نەک هەموو ژەم/ قوبوولی و تاسکەبابی و تیکە ئیزرەم «بێکەس»› ٣. پاروو ‹هەرکەس کە دەسی بە تیکە نانێ بڕەسێ/ لاکۆخێ هەبێ شەوانە تێیدا وەحەسێ «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ≡ ١. پاره؛ قطعه ٢. ساندویچ ٣. لُقمه

**تیکە . تیکە** / tîke tîke/: ئاوەڵناو. لەت‌ـ لەت؛ پارچە ـ پارچە ≡ تکه ـ تکه

⊡ **تیکە . تیکە کردن**: جنین؛ لەت ـ لەت کردن. هەروەها: **تیکە ـ تیکە بوون** ≡ انجیدن

**تیکەحەرام** / tîkeĥeram/: ئاوەڵناو. لە دایکێ کە نانی حەرامی خواردبێ ≡ حرام‌لقمه

**تیل**[1] / tîl/: ناو. ١. قەڵەمەداری تازە نراو ٢. سووچ؛ قوژبن ٣. کەلا؛ هەڵمات ≡ ١. قلمه‌ی تازه کاشته ٢. گوشه؛ زاویه ٣. تیله

⊡ **تیل کردن**: نیشاندان لە لاوە ≡ از گوشه نشان دادن

**تیل**[2]: ئاوەڵناو. ١. لار؛ ئاماڵ‌خوار؛ بە لایەکدا هاتوو ٢. قیت؛ دەرپەڕیو ٣. خێل؛ خوێل ≡ ١. کج؛ مایل ٢. برآمده ٣. لوچ

⊡ **تیل کردنەوە**: خوار کردنەوە ≡ خم کردن

**تیلا** / tîla/: ناو. تیل؛ سووچ؛ گۆشە؛ قوژبن ≡ گوشه

**تیلاگ** / tîlag/: ناو. لاتیلاگ؛ لاسەر ‹کڵاوی بە تیلاگی سەرییەوە نابوو، جوابی کەسی نەدەداوە!› ≡ یک طرف سر

**تیلاوتیل** / tîlawtîl/: ئاوەڵکار. خوارەخوار؛ لارەلار؛ لەسەرلا ≡ کجکی

**تیلایی** / tîlayî/: ناو. کونج؛ گۆشە ≡ گوشه

⊡ **تیلایی چاو**: گۆشەی چاو ‹یار بە ماچی لێوی خۆی زامی دلان سارێژ ئەکا/ هەر تیلایی چاوی پیاوی خێرە مەند و گێژ ئەکا «ئەحمەد موختار بەگی جاف»› ≡ گوشه‌ی چشم

**تیلچاو** / tîlçaw/: ناو. سیلەی چاو ≡ گوشه‌ی چشم

**تیلکە** / tîlke/: ناو. دیزەی چێشت ≡ دیزی

**تیلماسک** / tîlmasik/: ☜ **تیزماڵك**

**تیلمە** / tîlme/: ☜ **تیزماڵك**

**تیلوریوم** / tiluryum/: ناو. توخمی کیمیاوی وەک کانزا، بە ژمارەی ئەتومی ٥٢ و کێشی ئەتومی ١٢٧,٦٠ ⇐ تلوریُم

**تیلە** / tîle/: ناو. ١. تولە؛ تووتکەکسۆک؛ بێچووە سەگ ٢. گۆشە؛ سووچ؛ قوژبن ‹بەس بێ! بەس بچۆ! بەس خۆت بنوێنە!/ بەس بە تیلەی چاو جەرگم دەربێنە «فولکلۆر»› ٣. کەلا؛ هەڵمات؛ تیل ⇐ ١. تولەسگ ٢. گوشە ٣. تیلە

**تیلەشان** / tîleşan/: ناو. قەدپاڵ؛ گەوە ⇐ کمرکش کوە

**تیلەگ** / tîleg/: ناو. تیرەگ؛ تەپە ⇐ تپە

**تیلەمار** / tîlemar/: ناو. ١. بەچکەمار؛ چێلی مار ٢. ماری باریک ⇐ ١. بچە مار ٢. مار باریک

**تیلێن** / tîlên/: ناو. هەڵماتێن؛ مەڕمەڕێن؛ کەلایین؛ پلان؛ مێشان؛ ماتان ⇐ تیلەبازی

**تیم** / tîm/: ناو. ١. تیپ؛ دەستە؛ پۆل ٢. شاند ⇐ ١. تیم ٢. هیأت

**تیماج** / tîmac/: ناو. ١. پێستی ئاژەڵی خۆش کراوی دەباغ‌دراو ٢. پارچەیێ لەو پێستە کە بۆ مەبەستێکی تایبەت جیاوەکراو ⇐ ١و٢. میشن

**تیمار** / tîmar/: ناو. ١. کاری ڕنەک کردنی یەکسم؛ شاڵ و قاشاغ کێشان ٢. خزمەت و ئاگاداری لە نەخۆش ‹دڵ چلۆن نەپسێ لە داخی دەستی ناعەدلی زەمان/ نایەڵێ دەستێ ببەم بۆ مەرهەم و تیماری خۆم «قانع»› ⇐ ١. عمل شال کشیدن و تمیز کردن ستور ٢. پرستاری؛ مراقبت

⊡ **تیمار کردن**: ١. چارە کردن ٢. خزمەت و ئاگاداری کردن ⇐ ١. راە حل پیدا کردن ٢. مراقبت کردن

**تیمارخانە** / tîmarxane/: ناو. نەخۆشخانە؛ خەستەخانە ⇐ بیمارستان

**تیمارستان** / tîmaristan/: ناو. نەخۆشخانەی ڕەوانی ⇐ تیمارستان

**تیمارکەر** / tîmarker/: ناو. ١. برین‌پێچ؛ یاریدەری حەکیم ٢. خزمەتکاری نەخۆش ٣. ڕنەکدەری یەکسم ⇐ ١. پزشکیار ٢. پرستار ٣. مهتر

**تیمان** / tîman/: ناو. کەوپێچ؛ ئەو شوێنە پۆلی کەوی پێدا دەڕۆن و ڕاوچییان ڕاویان دەکەن ⇐ محل عبور دستەی کبک

**تیمانج** / tîmanc/: ناو. ١. تیماج؛ جۆرێ پێستەی تەنک ٢. برشتی باریک لە چەرم ⇐ ١. میشن ٢. نوار چرمی

**تیمچە** / tîmçe/: ناو. قەیسەری؛ بازارۆکە لە بازاری گەورەدا ⇐ تیمچە

**تیمساح** / tîmsaĥ/: ناو. کروکودیل؛ جانەوەرێکی خزۆک بە پۆزە و کلکی درێژ، چوار دەست و پێ و لەشی گرناڵ و سەر پشت داپۆشراو بە پووڵەکەی پەڕەئاسا و ددانگەلێکی زۆری بزمارینەوە ⇐ تمساح

**تیمسار** / tîmsar/: ناو. ژێنراڵ؛ ئەمیر ⇐ تیمسار

**تیمساڵ** / tîmsał/: ناو. پەیکەر؛ کۆتەڵ ⇐ تندیس

**تیموس** / tîmûs/: ناو. لوویەکە لە پشت چۆڵەمەی سینگی منداڵاندا کە تا بالغ بوون گەورە دەبێ و پاشان وردە ـ وردە دەتوێتەوە و لە ناو دەچێ ⇐ تیموس

**تین**[١] / tîn/: ناو. ١. هێز؛ وزە؛ تاقەت؛ تابشت ‹تۆ بڵێی پاشی نەمان ژینێ بێ؟/ بۆ لەشی ساردەوە بوو تینێ بێ؟ «سوارە»› ٢. تن؛ گەرما؛ گڕە؛ تاو ‹نەتدەزانی تینی لێ‌جوێ‌بوونەوەت دەمکا بە چێشت؟/ هەر بە چەشنی شەم لە جێی خۆم دەسبەجێ دەتوێمەوە «ئاوات»› ٣. توون؛ ئاگردانی گەرماو ٤. بناغە؛ هیم ٥. *[مەجاز]* گڕ؛ ئاگر ‹من دڵداری کوردستانم و لەوەتا بیر ئەکەمەوە، بە تین و

تاوی ئەو ئەوینەوە ئەسووتێم «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ٦. *[مەجاز]* شۆڕ؛ ئەوین؛ عەشق ٧. تەوژم؛ زۆری (بەتایبەت لە لایەنی هێزەوە) ‹ئەو سەبوونەمان لە کوێوە بۆ هات؟/ بە تینی گەرمی هەڵقرچا ولات «پیرەمێرد»› ☰ ١. تاب و توان ٢. حرارت ٣. گُلخن ٤. شالوده؛ اساس ٥. آتش؛ شعله ٦ شور ٧. فشار

**تین**[2]: ☜ **تینو**[2]

**تینتینۆکە** / tîntînoke/: ناو. ئەوک؛ قوڕگ ☰ حلق

**تینشکی** / tînişkî/: ناو. ئاڤزەلێلک؛ ئاوبەند؛ زکەماسێ؛ ئیسقایی؛ نەخۆشی زگ ئاوسان ☰ استسقاء

**تینک** / tînik/: ناو. ڕایەڵی بووزوو؛ ڕاهەنگاوتەی شاڵ ☰ تارهای افقی در شالبافی

**تینگ**[1] / tînig/: ناو. ئالوو؛ لووزەتێن؛ بادامەی لای مل ☰ لوزتین

**تینگ**[2]: ☜ **تینو**[2]

**تینگەرم** / tîngerm/: ئاوەڵناو. شێلەوگەرم؛ شەلۆ ☰ ولرم

**تینگی** / tîn(i)gî/: ☜ **تینویەتی**

**تینگیز** / tîngîz/: ☜ **تەنگز**

**تینواتی** / tînwatî/: ☜ **تینویەتی**

**تینوایەتی** / tînwayetî/: ☜ **تینویەتی**

**تینوەتی** / tînwetî/: ☜ **تینویەتی**

**تینوێتی** / tînwêtî/: ☜ **تینویەتی**

**تینۆ** / tîno/: ناو. ١. گەروو؛ گەڵوو؛ قوڕگ ٢. ☜ تینو[2] ☰ ١. گلو ٢. ☜ **تینو**[2]

**تینو**[1] / tînû/: ناو. ئەوک؛ قوڕگ ☰ حلق

**تینو**[2]: ئاوەڵناو. توونی؛ تەژنە؛ تی؛ تین؛ تینگ؛ تینۆ؛ تینی؛ تیەنگ؛ تیە؛ تیهن؛ تیهنی؛ تێن؛ تێنوو؛ ئاتاجی ئاو خواردن ‹تینوو، لە خەوا بەفراو ئەبینێ «مەسەل»› ☰ تشنه

**تینویەتی** / tînûyetî/: ناو. توونیەتی؛ توونیایەتی؛ تەنووی؛ تەنوویی؛ تینگی؛ تینواتی؛ تینوایەتی؛ تینوەتی؛ تینوێتی؛ تینیەتی؛ تیەنگی ☰ تشنگی

**تینەگیا** / tîneg(i)ya/: ناو. تاسئەور؛ خەردەلە چەرمەلە ☰ خردل سفید

**تینی**[1] / tînî/: ناو. ١. کار و ڕەوتی نەفەس خواردنەوەی بلوێرژەن ٢. ئەوک؛ قوڕگ ☰ ١. کار نفس فرو دادن سُرناچی ٢. حلق

**تینی**[2]: ☜ **تینو**[2]

**تینیەتی** / tînyetî/: ☜ **تینویەتی**

**تینێر** / tînêr/: ناو. تراوێکی کیمیاوی بۆ شل کردنەوە و تەڕکردنی ڕەنگ ☰ تینر

**تیوار** / tîwar/: پێرۆ. ← **تەنگوتیوار**

**تیواندن** / tîwandin/: ☜ **تواندنەوە**

**تیوپ** / t(i)yup/: ناو. ئاڵقەیەکی ناوخاڵی و بێدرز لە قایش کە دەکەوێتە ناو تەگەرەوە و بە تەوژمەوە بای تێ دەکەن ☰ تیوب

**تیوتی** / t(i)yutî/: ئاوەڵکار. ١. لە گۆشە و کەنارەوە ٢. لارەلار؛ کار و ڕەوتی ڕەت بردن بە هەر دوو لادا ☰ ١. از گوشه و کنار ٢. تلو ـ تلو

**تیوتیوە** / tîwtîwe/: ☜ **تیفتیفە**

⊡ **تیوتیوە دان**: ☜ **تیفتیفە دان**

**تیوڵ** / tîwił/: ☜ **تیوێل**

**تیوڵس** / t(i)yułs/: ☜ **تیوێل**

**تیوەرە** / tîwere/: ☜ **تورەکە**

**تیوێل** / tîwêl/: ناو. توێل؛ تیول؛ ئەنی؛ ناوچاوان ☰ پیشانی

**تیوز** / t(i)yûz/: ناو. بیژووکەزا؛ کاژیلەی یەک ساڵە کە بێچووی بێ ☰ بُزغالەی یکسالە کە بچە بزاید

**تیوڵ** / t(i)yûł/: ئاوەڵناو. ناسک و تەنک ☰ نازک و باریک

**تیون** / t(i)yûn/: ئاوەڵناو. ناسک؛ نازک ☰ نازک

**تیە** / t(i)ye/: ناو. دیدە؛ چاو؛ دیە ☰ دیدە؛ چشم

**تیەرزیان** / t(i)yrz(i)yan/: چاوگ. تیەرزین؛ سەرفین؛ ژیان ☰ ارزیدن

**تیەرزین** / t(i)yrzîn/: ☜ **تیەرزیان**

**تیەڵ** / t(i)yeł/: ☜ **تاڵ**[٢]

**تیەنگ** / t(i)yen(i)g/: ☜ **تینو**[٢]

**تیەنگی** / t(i)yen(i)gî/: ☜ **تینویەتی**

**تیە** / tîh/: ☜ **تینو**[٢]

**تیهن** / tîhin/: ☜ **تینو**[٢]

**تیهنی** / tîhnî/: ☜ **تینو**[٢]

**تییە** / tîye/: ناو. قەبارە؛ شاقەڵ ☰ حجم

**تییەڵ** / tîyeł/: ☜ **تاڵ**[٢]

**تییەڵی** / tîyełî/: ☜ **تاڵی ـ١**

**تێ**[١] / tê/: ناو. ١. ناوی پیتی پێنجەمی ئەلفوبێی کوردی ٢. تا؛ یاو؛ نۆبەتی ٣. سووسکە؛ سوێسکە ☰ ١. نام حرف پنجم الفبای کُردی ٢. تب ٣. تیهو

**تێ ـ**[٢]: پێشگر. ١. دەنێو/ لەنێو کەسێ، شتێ یان دیاردەیەک ‹تێچوون؛ تێخستن› ٢. دە/ لە کەسێ، شتێ یان دیاردەیەک ‹تێکۆشان؛ تێخوڕین› ☰ ١. تو؛ به درون ٢. در؛ از

(**تێبینی**: پێشگری «تێ»: ١. دەچێتە سەر زۆربەی چاوگەکان (سادە و تێکەڵ و لێکدراو) و چاوگێکی تازە پێک دێنێ ٢. دەچێتە سەر ڕەگی کار/ چاوگ و، ئاوەڵناو یان ناوی چاوگ دروست دەکا)

**تێئاخندراو** / tê'axind(i)raw/: ئاوەڵناو. قرساو ☰ آکنده

**تێئاخنین** / tê'axnîn/: چاوگ. بە زۆر خستنە ناوەوە ☰ چپاندن

**تێئاڵان** / tê'ałan/: چاوگ. لێ‌هاڵان ☰ بە دور چیزی پیچیدن

**تێئاڵاندن** / tê'ałandin/: چاوگ. لێ‌هاڵاندن ☰ دور چیزی پیچاندن

**تێبردن** / têbirdin/: چاوگ. تێ‌نان؛ دە ناو خستن ☰ فروبردن

**تێبڕان** / têb(i)řan/: چاوگ. بە زۆر دە ناو چوون ☰ چپانیده شدن

**تێبڕین** / têb(i)řîn/: چاوگ. بە زۆر دە ناو نان ☰ چپاندن؛ فروکردن

**تێبەربوون** / têberbûn/: چاوگ. ١. بەرەو ڕوو چوونی شتێ وەک تێهەڵگڕانی ئاگر ‹بلا گول ئاتەشی تێبەربێ، پەروانە بێ بولبول/ دەبێ هەر بچمە باغ و ڕازی دل شەممێکی بەر با دەم «مەحوی»› ٢. بە هەڵپە بۆ شتێ پەل کوتان، (وەک: شیر مژینی بێچووی ئاژەل لە گوانی دایک) ٣. هورووژم هێنان و پەلامار دان ‹وەک گورگی برسی تێبەربوون› ☰ ١. دامنگیر شدن ٢. با وَلَع به چیزی روی آوردن ٣. یورش بردن

**تێبەردان** / têberdan/: چاوگ. ١. خستنە گیان (وەک: نانی ئاگر بە شتێکەوە، یان بەرهەڵدا کردن و دنە دانی سەگ و ... بەرەو کەسێ یا شتێ) ‹نەمام نەمامە، نەمام چەند جوانە/ ئاگری تێبەردام پەرچەم ڕێحانە «فولکلۆر»› ٢. بەرهەڵدا کردنی زا بۆ ماک ٣. بەردانی بە تێکڕایی و پەڕاندنی نێر بۆ سەر مێ ‹کەل تێبەردان› ٤. بەردانی تەوش و گەڕۆکێک بۆ ناو شتێکی‌تر ☰ ١. بە جان (کسی یا چیزی) انداختن ٢. رها کردن بچەی دام برای مکیدن پستان مادر ٣. رها کردن نر به جفتگیری ۴. بستن مایعی به چیزی

**تێبین** / têbîn/: ئاوەڵناو. وردەکار؛ خاوەن‌هزر؛ بیر ڕووناک ☰ اندیشمند

**تێبینی** / têbînî/: ناو. ١. سەرنج؛ کاری وردکردنەوە ٢. هزر و بیر لە دوایی کار ٣. کار و ڕەوتی کۆڵینەوە؛ حەول دان بۆ زانینی نەزانراو ☰ ١. ملاحظه؛ توجه ٢. عاقبت‌اندیشی ٣. کنکاش

**تێپەڕ**[١] / têpeř/: ناو. ١. گوزەر؛ کار یان ڕەوتی

ڕەت بوون ٢. کۆتایی؛ دوایی ☰ ١. عبور ٢. انجام

**تێپەڕ**[٢]: ئاوەڵناو. ١. گوزەرا؛ تایبەتمەندی ئەو شتەی دەڕوا و نامێنێتەوە ٢. *[ڕێزمان]* تایبەتمەندی کرداری کە بەرکاری پێویستە. بەرانبەر: **تێنەپەڕ** ☰ ١. گذرا ٢. مُتعدی

⊡ **تێپەڕ بوون**: چوونەسەر؛ تێپەڕین ‹لە سەر تێپەڕ بووە خوێناوی جەرگم/ بە سەرما بێنە، ئەی دڵ! ماجەرا بەس «مەحوی»› ☰ گذر کردن

**تێپەڕ کردن**: ١. تێپەڕاندن؛ دانەسەر ٢. بگاردن؛ ڕابووڕین؛ ڕۆیشتن ☰ ١. گذراندن ٢. گذشتن

▪ **تێپەڕ**[٣]: پاشەوشە. ـ بوار؛ ـ بگار؛ ـ ویار؛ لە چووندا ‹چاوەڕێم چەرخەی نیگای تیژتێپەڕ/ لە چاوما بکات هەستی ئەشکی تەڕ «گۆران»› ☰ ـ گُذر

**تێپەڕان** / têpeřan/: ☞ **تێپەڕین**

**تێپەڕاندن** / têpeřandin/: چاوگ. ١. پێکهێنانی کار ٢. بە سەر بردن ٣. کردنە ناو ‹ئەو تەماتە بێ خاوەن نییە، مانگاکەت تێپەڕاندووە!› ٤. ڕەت کردن ‹لە درزی پەردە دیبای بەژنی یاری/ لە سیحری تێپەڕاندبا سۆزی تاری «هێمن»› ☰ ١. انجام دادن ٢. گذراندن ٣. در جهتی عبور دادن ۴. گذراندن

**تێپەڕین** / têpeřîn/: چاوگ. تێپەڕان؛ ڕابردن: ١. کات نەمان؛ بەسەرچوون ‹لە ڕۆژان هەرگیز خەم ناخۆم بۆ دوو:/ ئەوەی تێپەڕی و ئەوەی دێتەدەر «گۆران»› ٢. ڕەت بوون؛ چوونەسەر ‹ئەو گوڵی بوو مێزی بادە و پۆکەر و یاری ئەوێ/ واتە تۆی بۆ تێپەڕینی کاتی بێزاری ئەوێ «ئەحمەد هەردی»› ٣. بگاردن؛ بووردن؛ بووڕین ‹ڕێوی بە لایدا تێپەڕی، چاوی بە قەل کەوت و مەڵێ/ ویستی بە فێڵێ لێ سەنێ، دەسپێکرد پێ هەڵبلێ «یونس دلدار»› ☰ ١. مُنقضی شدن ٢. گذشتن ٣. عبور کردن

**تێپەڕیو** / têpeřîw/: ئاوەڵناو. بواردوو؛ ڕابردوو ☰ عبور کرده

**تێ‌پەستان** / têpestan/: چاوگ. ١. بە نهێم تێ‌نان ٢. تێ‌تەپان؛ بە نهێم تێ‌چوون ☰ ١. چپاندن ٢. چپیدن

**تێ‌پەستاوتن** / têpestawtin/: چاوگ. تێ‌پەستان ☰ چپاندن

**تێ‌پەستراو** / têpest(i)raw/: ئاوەڵناو. ئاخنراو ☰ آکنده

**تێ‌پێچان** / têpêçan/: چاوگ. ١. لێ‌هاڵاندن؛ لێ‌پێچاندن ٢. لێ‌هاڵان؛ لێ‌پێچان ☰ ١. پیچاندن به دور چیزی ٢. پیچیدن به دور چیزی

**تێ‌پێچاندن** / têpêçandin/: چاوگ. لێ‌پێچاندن ☰ پیچاندن به دور چیزی

**تێت** / têt/: ناو. تاتەبەردێ کە گۆلاوی لە سەر بێت ☰ تختەسنگ دارای چالەی پر آب

**تێ‌ترشان** / têtirşan/: چاوگ. تێ‌پەستان؛ تێ‌تەپان ‹کۆڕی دانیشتن تا ئەهات ئەکشا/ کورسی جێی چوار بوو، دەی تێ‌ئەترشا «گۆران»› ☰ میان چیزی چپیدن

**تێ‌ترنجان** / têt(i)rincan/: چاوگ. تێ‌ترینجان؛ گیرکردن لە شوێنی تەنگدا ☰ چپیدن در چیزی

**تێ‌ترنجاندن** / têt(i)rincandin/: چاوگ. تێ‌ترینجاندن؛ تێ‌تەپاندن ☰ در چیزی چپاندن

**تێ‌ترینجان** / têt(i)rîncan/: ☞ **تێ‌ترنجان**

**تێ‌ترینجاندن**/ têt(i)rîncandin/: ☞ **تێ‌ترنجاندن**

**تێ‌تکان** / têt(i)kan/: چاوگ. تنۆک کەوتنە ناو؛ دڵۆپ تێ‌ڕژان ☰ چکیدن در چیزی

**تێ‌تکاندن** / têt(i)kandin/: چاوگ. بە تنۆک تێ‌ڕژاندن ☰ چکانیدن در چیزی

**تێ‌توڕاندن** / têtûřandin/: چاوگ. فوو پێدا کردن (زۆرتر بۆ شمشاڵ و...) ☰ دمیدن در چیزی

**تێ‌تەپان**/ têtepan/: چاوگ. ١. ☞ **تێ‌پەستان ـ٢** ٢. دارمان ☰ ١. ☞ **تێ‌پەستان ـ٢** ٢. فروریختن

در چیری

**تێ‌ته‌پاندن / têtepandin/:** ☜ **تێ‌ترنجاندن**

**تێ‌ته‌پیاگ / têtepyag/:** ئاوه‌ڵناو. گره‌وتا؛ گوڕۆتا؛ به‌ زۆر تێ‌ئاخنراو ☰ چپانده شده

**تێ‌ته‌قان / têteqan/:** چاوگ. هه‌ڵاتنی به‌ په‌له‌ و به‌ ترسه‌وه‌ ‹وا ڕای کرد ملی شکان/ بازه‌ی دی، ڕۆیی تێی‌ته‌قان «بێکه‌س»› ☰ گریختن از ترس

**تێ‌ته‌قاندن / têteqandin/:** چاوگ. به‌ په‌له‌ چوون ☰ با عجله رفتن

**تێ‌چاندن / têçandin/:** چاوگ. تێ‌چه‌ندن: ۱. ورده‌ به‌ ته‌ندوورا ڕژاندن ‹بۆ ئه‌وه‌ی ئاوره‌که‌ دانه‌مرکێ، ئه‌و پووش و په‌ڵاشه‌م تێ‌چاند› ۲. ئارد ورده‌ ـ ورده‌ به‌ سه‌ر ڕۆنی داغدا پرژاندن ۳. *[مه‌جاز]* شه‌یتانی و شووفاری کردن ‹میرانی ئێران لای شاعه‌بباسی یه‌که‌م بۆیان تێ‌چاند که‌ میرقه‌ره‌تاج نیازی وایه‌ له‌ شا یاخی بێت «هه‌ژار، *مێژووی ئه‌رده‌ڵان*»› ٤. چاندن ‹خودایان له‌ ڕۆحمان ده‌رهێنا و ڕقیان تێ‌چاند «شێرکۆ»› ☰ ۱. سوخت در تنور ریختن ۲. کم‌ـکم آرد بر روغن داغ پاشیدن ۳. سخن‌چینی کردن ۴. کاشتن

**تێ‌چریکان / têç(i)rîkan/:** چاوگ. تێ‌چریکاندن؛ به‌ ده‌نگی به‌رز گۆرانی گوتن ☰ بانگ سردادن

**تێ‌چریکاندن / têç(i)rîkandin/:** ☜ **تێ‌چریکان**

**تێچڕان / têç(i)řan/:** چاوگ. تێ‌چڕژان؛ کۆ بوونه‌وه‌ی حه‌شاماتی زۆر ☰ گرد آمدن انبوه مردم

**تێ‌چڕژان / têçiřjan/:** ☜ **تێچڕان**

**تێ‌چڕژاندن / têçiřjandin/:** چاوگ. کۆ کردنه‌وه‌ی حه‌شامه‌تێکی زۆر به‌ چڕی و جمکوتی ☰ گرد آوردن جمعیت انبوه

**تێ‌چزان / têç(i)zan/:** چاوگ. تێ‌زان؛ تێ‌زایین ☰ خون زیر پوست دویدن

**تێچوو / têçû/:** ئاوه‌ڵناو. ۱. تێشکاو ۲. له‌ به‌ین‌چوو ۳. به‌خت‌کراو؛ خه‌رج‌کراو ☰ ۱. شکست‌خورده ۲. نابود شده ۳. هزینه‌شده

**تێچوون / têçûn/:** چاوگ. ۱. تێ‌شکان ۲. بنه‌بڕ بوون؛ فه‌وتان ۳. خه‌رج هه‌ڵگرتن ☰ ۱. شکست خوردن ۲. نابود شدن ۳. خرج برداشتن

**تێ‌چه‌قان / têçeqan/:** چاوگ. تێ‌چه‌قین: ۱. تێ‌هه‌ڵچوون؛ شتی باریک به‌ شتی ئه‌ستووردا چوون ۲. *[کینایه]* تێدا مانه‌وه؛ ده‌ره‌تان بۆ نه‌مان ‹زیاتر له‌ ئاکامی کارێکی هه‌ڵه‌دا› ☰ ۱. خلیدن؛ فرورفتن ۲. پای در گل ماندن

**تێ‌چه‌قاندن / têçeqandin/:** چاوگ. باریک و تیژ به‌ ئه‌ستووردا کردن ☰ خلانیدن؛ فروکردن

**تێ‌چه‌قین / têçeqîn/:** ☜ **تێ‌چه‌قان**

**تێ‌چه‌ندن / têçendin/:** ☜ **تێچاندن**

**تێچین / têçîn/:** ئاوه‌ڵناو. دزنێره‌؛ شووفار ☰ سخن‌چین

**تێچێن**[۱] **/ têçên/:** ناو. ۱. که‌سێ که‌ ئارد به‌ ڕۆنی داغدا ده‌کا ۲. ئه‌وی پشکه‌ڵ و کا ورده‌ ـ ورده‌ به‌ ته‌ندوورا ده‌ڕێژێ ☰ ۱. کسی که آرد بر روغن داغ بپاشد ۲. کسی که سوخت در تنور می‌ریزد

**تێچێن**[۲]: ئاوه‌ڵناو. شووفار؛ قسه‌به‌ر ☰ سخن‌چین

**تێخ / têx/:** ☜ **تیخ**

**تێ‌خران / têx(i)ran/:** چاوگ. تێ‌خریان؛ خرانه‌ ناو شتێکه‌وه‌ ☰ داخل چیزی کردن

**تێ‌خریان / têxiryan/:** ☜ **تێ‌خران**

**تێ‌خزان / têx(i)zan/:** چاوگ. تێ‌خزین؛ تێ‌خزیان؛ خزانه‌ ناو شتێکه‌وه‌ ☰ داخل چیزی خزیدن

**تێ‌خزاندن / têx(i)zandin/:** چاوگ. تێنان به‌ هێز؛ تێ‌ته‌پاندن ☰ چپاندن

**تێ‌خزیان / têxizyan/:** ☜ **تێ‌خزان**

**تێ‌خزین / têx(i)zîn/:** ☜ **تێ‌خزان**

**تێ‌خستن / têxistin/:** چاوگ. ۱. خستنی شتێ له‌ ناو شتی‌تر ۲. تێ‌ڕۆ کردن؛ تێ‌نان ☰ ۱. داخل

کردن ٢. فرو کردن

**تێخوڕین** / têxuřîn/: چاوگ. ١. لێ گوڕاندن؛ بە قەو دواندن؛ توند و بە تووڕەییەوە قسە دەگەڵ کردن ٢. *[مەجاز]* فوو بە شمشاڵ و ئامێری مۆسیقاییدا کردن ‹هۆ شوانی بەختیار! تێ خوڕە! درەنگە/ بێ شمشاڵ لە دەشتیش وەکوو ماڵ دڵتەنگە «گۆران»› ☰ نهیب زدن

**تێخوڵ** / têxuł/: ☜ تویکڵ

**تێخونجان** / têxuncan/: چاوگ. تێ ترنجان؛ بە نهێم تێچوون ☰ با فشار جاشدن

**تێخونجاندن** / têxuncandin/: چاوگ. تێ ترنجاندن؛ بە نهێم تێنان ☰ با فشار جاکردن

**تێخۆڵ** / têxoł/: ناو. پێست؛ پێس ☰ پوست

**تێخە** / têxe/: ☜ تیغە

**تێدا**[1] / têda/: ئامراز. دە نێودا؛ لە ناودا ‹مەوج مەدۆ زوهوور نوور حەق تێدا/ هەر ڕەگ مەشعەلێ مەویەرۆ پێدا «مەولەوی»› ☰ از؛ در؛ تو

**تێدا**[2]: پێشگر. ↓

(**تێبینی**: پێشگری «تێدا»: ١. دەچێتە سەر چاوگ و چاوگێکی تازە پێک دێنێ ‹تێداچوون› ٢. دەچێتە سەر ڕەگی کار و چاوگ، ئاوەڵناوی کارا یان بەرکار دروست دەکا ‹تێدابەر تێداچوو›)

**تێداچوون** / têdaçûn/: چاوگ. لە بەین چوون؛ مردن ☰ از بین رفتن؛ مُردن

**تێدامان** / têdaman/: چاوگ. تێدامانەوە؛ لە کارێکدا دەسەوسان مان ☰ درماندن

**تێدامانەوە** / têdamanewe/: ☜ تێدامان

**تێدان** / têdan/: چاوگ. ١. لێدان؛ بەر بوونە ناو شتێک/ جێگایەک؛ ڕۆیشتە ناو شوێن یان شتێکەوە ‹برنجەکە سپێ تێیداوە› ٢. تێ هەڵسوونی ماکی نەرم و هەویرئاسای وەک قوڕ یان مەڵحەم ... ٣. تێ کردنەوە؛ لێ زیاد کردن؛ پارچەیەک خستنە سەر پارچەیەکی دی یان کاری لەو چەشنەیە ☰ ١. زدن ٢. اندودن ٣. تکه ـ تکه بر هم دوختن

**تێدانەوەستاو** / têdanewestaw/: ئاوەڵناو. دەڤبەردا؛ دەڤشۆ؛ قسەپەڕێن ☰ بی‌ملاحظه

**تێداهێشتنەوە** / têdahêşt(i)newe/: چاوگ. تیاهێشتنەوە: ١. هێشتنەوەی هەندێک شت لە دەفرێکدا و بە کار نەهێنانی ٢. *[کینایە]* هەمووی نەخواردن ٣. *[مەجاز]* ڕاگرتنی حورمەت لە عاجزی و شەڕدا ☰ ١. باقی گذاشتن ٢. همه را نخوردن ٣. حد و حُرمت نگهداشتن

**تێر**[1] / têr/: ئاوەڵناو. ١. تەسەل؛ مر ٢. بە ڕەنگی تۆخەوە ☰ ١. سیر؛ پُر ٢. تیره رنگ

⊡ **تێر بوون** ١. لە برچیتی خەلاس بوون ٢. *[مەجاز]* بێزار بوون ‹ژین بە یەخسیری و دیلی بێ کەڵکە/ بۆیە لە مێژە لە ژینم تێرم «هێمن»› ☰ ١. سیر شدن ٢. دلزده شدن

**تێر خواردن** ١. نەمانی برسییایەتی؛ خواردن تا بێ نیاز بوون ٢. *[مەجاز]* وەڕەز بوون ☰ ١. سیر خوردن ٢. بیزار شدن

**تێر کردن** بە ئەندازەی شیاو خۆراک پێ دان و برسییەتی نەهێشتن ‹تێری کرد و ناردی› ☰ سیر کردن

**تێر**[2]: ئاوەڵکار. باش؛ بە تەواوی ‹وەختێو ئایارە نزیکم مەبۆ/ لاو سەرەیمەنە تێر سەیرم کەرۆ «سەیدی»› ☰ دل سیر؛ کاملاً

**تێر**[3]: پێشوشە. پڕ ‹تێرگۆشت؛ تێرخوێ؛ تێراو؛ تێرپۆش› ☰ پُر-

**-تێر**[4]: پاشەوشە. پڕ؛ تژی ‹بەرچاوتێر؛ زگ‌تێر› ☰ سیر

**تێراو** / têraw/: ئاوەڵناو. پاراو؛ تایبەتمەندی سەوزە و دەغڵی باش ـ باش ئاودراو ‹لەعلی شەککەرباری تۆ تێراوە، شەککەر باریە/ لێوی میحنەتباری من بێ‌ئاوە، باری گرتووە «نالی»› ☰

شاداب

**تێراوی** / têrawî/: ناو. هێوایی؛ پڕئاوی ☰ پُرآبی

**تێربەز** / têrbez/: ☜ **تێرگۆشت**

**تێرپ** / têrp/: ☜ **تووڕ–١**

**تێرخوێ** / têrx(i)wê/: ئاوەڵناو. نیوەسوێر (چێشت) ☰ نیم‌شور (غذا)

**تێرشک** / têrşik/: ☜ **ترشۆکە**

**تێرگۆشت** / têrgoşt/: ئاوەڵناو. تێربەز؛ قەڵەو؛ تفقی؛ چاخ؛ هەملک ☰ چاق؛ فربە

**تێرنج** / têrinc/: ☜ **تیرنج**

**تێرنەخۆر** / têrnexor/: ☜ **تێرنەخۆرە**

**تێرنەخۆرە** / têrnexore/: ئاوەڵناو. تێرنەخۆر؛ بەرچاوبرسی؛ تایبەتمەندی شتێ یا کەسێ کە بە هیچێ تێر ناخوا ‹چیت بۆ بکەم تا نەهێڵم/ تێرنەخۆرە پارووی دەمت کونترۆڵ بکەن؟! «پەشێو»› ☰ حریص

**تێروپڕ**[1] / têr û piř/: ئاوەڵناو. تەواو پڕ ‹سفرەی تێروپڕ› ☰ پُر پُر

**تێروپڕ**[2]: ئاوەڵکار. تەواو تێر ‹تێروپڕم خوارد› ☰ سیرِ سیر

**تێروو**[1] / têrû/: ناو. تریو؛ تیروێ؛ تریو؛ دارچکێکی لێرەوارە و دەوەنە ☰ درختچەای جنگلی

**تێروو**[2]: ئاوەڵناو. دڕندە ☰ درّندە

**تێرەخوەرە** / têrex(i)were/: ناو. گوڵان؛ بانەمەڕ ☰ اردیبهشت

**تێرەخۆرە** / têrexore/: ناو. ئەوەندەی برسی تێر بکا؛ خواردنی ژەمی برسییەک ☰ آن مقدار از خوراک کە گرسنە را سیر کند

**تێری** / têrî/: ناو. ١. تێریەتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی تێر بوون ٢. تۆخی ڕەنگ ☰ ١. سیری ٢. پُررنگی

**تێریەتی** / têryetî/: ☜ **تێری–١**

**تێڕ** / têř/: ناو. تێرک؛ هۆڕ؛ خورجێنی گەورەی دووتایی ‹گوێ لە پەندم گرە کاکی ئاشێر!/ چت لە نۆبە و مزەئاش و کەر و تێڕ؟ «حەقیقی»› ☰ خورجین بزرگ

**تێ‌ڕابینی** / têřabînî/: ☜ **تێ‌ڕادیوی**

**تێ‌ڕاچوون** / têřaçûn/: چاوگ. تێ‌هەڵچەقان؛ تێ‌چەقان ☰ خلیدن

**تێ‌ڕاخورین** / têřaxuřîn/: چاوگ. بە سەردا نەڕاندن و تووڕە بوون ☰ بر (سر کسی) فریاد کشیدن

**تێ‌ڕادان** / têřadan/: چاوگ. ئاو دە دەفر وەردان بۆ خاوێن بوونەوە ☰ آبکشی کردن و شستن

**تێ‌ڕادیتن** / têřadîtin/: چاوگ. تێ‌ڕادین؛ پێدا پەرموون؛ پیا پەرمیان؛ متمانە پێ‌کردن ☰ پُشت بستن

**تێ‌ڕادین** / têřadîn/: ☜ **تێ‌ڕادیتن**

**تێ‌ڕادیوی** / têřadîwî/: ناو. تێ‌ڕابینی؛ بڕوا؛ ڕابینی؛ ڕەوت و چۆنیەتی پەرمان ☰ اعتماد

**تێ‌ڕاکردن** / têřakirdin/: چاوگ. تێ‌چەقاندن؛ دە ناودا جێ‌کردنەوە ☰ فروکردن

**تێ‌ڕامان** / têřaman/: چاوگ. سەرنج پێ دان؛ لێ وردبوونەوە ☰ با دقت نگاه کردن

**تێڕتێڕە** / têřtêře/: ناو. بزن‌مژە؛ قومقومە؛ خەمەگروو ☰ بُزمجه

**تێ‌ڕژان** / têř(i)jan/: چاوگ. تێ‌ڕژیان؛ ڕژانە ناو ☰ ریختن توی چیزی

**تێ‌ڕژاندن** / têř(i)jandin/: ☜ **تێ‌ڕژتن**

**تێ‌ڕژتن** / têřijtin/: چاوگ. تێ‌ڕشتن؛ تێ‌ڕژاندن؛ ڕژاندنە ناو ☰ ریختن توی چیزی

**تێ‌ڕژیان** / têř(i)jyan/: ☜ **تێ‌ڕژان**

**تێ‌ڕشتن** / têřiştin/: ☜ **تێ‌ڕژتن**

**تێڕک** / têřik/: ☜ **تێڕ**

**تێ‌ڕوانین** / têř(i)wanîn/: چاوگ. بە زەقی تەمەشا کردن ‹کتێب گرەوەی دەسبڕی بێ‌دین/ ڕێی ژووری نەدەی لە بۆ تێڕوانین «موفتی

پێنجوێنی»› ☰ خیره در چیزی نگریستن

**تێڕۆچوون** / têřoçûn/: چاوگ. پێداهەڵچەقان ☰ فروشدن

**تێڕۆکردن** / têřokirdin/: چاوگ. تێنان؛ دە ناو نان ☰ فروکردن

**تێڕۆهاتن** / têřohatin/: چاوگ. ١. هێرش بردن؛ پەلامار دان ٢. ڕفاندن؛ پڕپێدا کردن ☰ ١. حمله بردن ٢. ربودن؛ قاپیدن

**تێڕووچانێک** / têřûçanêk/: ناو. زۆران؛ زۆرەوانی ☰ کُشتی

**تێڕیان** / têř(i)yan/: چاوگ. *[شوورەیی، پلار]* گوو تێ‌کردن ☰ ریدن توی چیزی

**تێز** / têz/: ناو. ١. تێزکە؛ تێزە؛ کونی لای چەخماخی تفەنگی ڕەشۆکی کە باریکە بارووتێکی تێدایە ٢. بارووتی ورد ٣. نامیلکەی پلەی دوکتورا ☰ ١. جامگی؛ سوراخ زیر چخماق تفنگ سرپُر ٢. باروت ساییده ٣. تِز؛ رساله

**تێزاب** / têzab/: ☜ **تێزاو**[1]

**تێزان** / têzan/: چاوگ. تێزاین؛ ئاو (تراو) تێدا پەیدا بوون ‹چاوم فرمێسکی تێزا/ ئەو لێوە .../ بۆ ئێستا زەردەخەنەی تێنازێ؟ «شێرکۆ»› ☰ آب (مایع) در چیزی جمع شدن

**تێزاین** / têzayn/: ☜ **تێزان**

**تێزایین** / têzayîn/: چاوگ. تێچزان؛ تێزان ☰ خون زیر پوست دویدن

**تێزکە** / têzke/: ☜ **تێز-١**

**تێزە** / têze/: ناو. ١. ☜ **تێز-١** ٢. سەر نووکی باریکی شت ☰ ١. ☜ **تێز-١** ٢. نوک باریک هر چیز

**تێزە . تێزە** / têze têze/: ناو. ١. پەلە؛ لەز ٢. دنە؛ هان ☰ ١. عجله ٢. تحریک

⊡ **تێزە . تێزە دان**: ١. وە پەلە خستن؛ پەلەپەل لێ کردن ٢. دنە دان؛ هان دان ☰ ١. به شتاب واداشتن ٢. تحریک کردن

**تێزە.تێزە لێ کردن**: سەر نانە سەر بۆ کردنی کارێ ☰ تشجیع کردن

**تێژ** / têj/: ☜ **تیژ**

**تێژاو** / têjaw/: ☜ **تیژاو**

**تێژک** / têjik/: ناو. بەچکە ساوای جانەوەری دڕندە ☰ نوزاد حیوان درنده

**تێژەنگ** / têjeng/: ناو. ڕێژاوی زۆر بە خوڕ و تەوژم ☰ مَصبّ پرآب

**تێژی** / têjî/: ☜ **تیژی**

**تێساو** / têsaw/: ناو. ١. هەسان؛ بەردەزوورە؛ بەردێ کە تێغی پێ تیژ دەکەن ٢. محەک؛ بەردی ڕەشی سیلیسی، ئەزموونی زێڕ ☰ ١. سنگ سوهان ٢. سنگ مَحَک

**تێساوین** / têsawîn/: چاوگ. تێسوون؛ پێداساوین؛ تێهەڵسوون ☰ سایدن بر چیزی

**تێسرماندن** / têsirmandin/: ☜ **تێسرەواندن**

**تێسرەوان** / têsirewan/: چاوگ. تێسرەوین؛ تێسرەویان؛ لێدران بە ناخافڵ ☰ ضربه خوردن ناگهانی

**تێسرەواندن** / têsirewandin/: چاوگ. تێسرماندن؛ لەپڕ و نەکاو لێدان ☰ ضربه زدن ناگهانی

**تێسرەویان** / têsirewyan/: ☜ **تێسرەوان**

**تێسرەوین** / têsirewîn/: ☜ **تێسرەوان**

**تێسکە** / têske/: ناو. ١. تێزەی تفەنگ ٢. ترووسکە؛ ورشە ☰ ١. جامگی تفنگ ٢. درخشش

**تێسکەتێسک** / têsketêsk/: ناو. ڕەوتی ترووسکانەوە؛ لە دوورەوە درەوشین ☰ سو-سو

**تێسمیڕیاگ** / têsimiřyag/: ئاوەڵناو. پتەوی قەد ئەستوور ☰ کت‌وکُلُفت

**تێسمڕیان** / têsimiřyan/: چاوگ. پتەو بوون و ئەستووری بە ساغییەوە ☰ درشت بودن

**تێسووین / têsuwîn/:** ☜ **تێساوین**

**تێسوو / têsû/:** ☜ **تۆسی**

**تێسوون / têsûn/:** ☜ **تێساوین**

**تێسووەبزنە / têsûwebizne/:** ناو. توێسییە بزنانە؛ جۆرێ توێسیی لاسق باریکی سپیواشە ⊠ گیاهی خاردار

**تێسووەکەرانە / têsûwekerane/:** ناو. توێسییە کەرانە؛ جۆرێ توێسیی لاسق ئەستووری مەیلەو سپی ⊠ گیاهی خاردار

**تێسووەگایە / têsûwegaye/:** ناو. جۆرێ توێسییە، لاسقەکەی پاک دەکەن و دەیخۆن، تامی جافری و گێزەر دەدا ⊠ گیاهی خاردار و خوراکی

**تێشت / têşt/:** ناو. تاشت؛ تاشتی؛ تێشتە؛ بەرقلیان؛ قاوەڵتی؛ قاوەتوون؛ نانی بەیانی ⊠ صبحانە

**تێشتە / têşte/:** ☜ **تێشت**

**تێشتەنگاو / têştengaw/:** ناو. ١. خۆراکی بەینی بەرقلیان و فراوین ٢. چێشتەنگاو؛ کاتی پێش نیوەڕۆ ⊠ ١. چاشتانە ٢. چاشتهنگام

**تێشتیر / têştîr/:** ☜ **توشتیر**

**تێشکان / têş(i)kan/:** چاوگ. تێشکیان: ١. شکان؛ بن کەوتن لە شەڕ یان لە سەودا و مامەڵەدا ‹دوژمنی گەل هەمیشە بە مەرەدی شا دەچن/ هەر دیکتاتۆر تێدەشکێ، هەر گەلن ڕزگار دەبن «هێمن»› ٢. هەڵشکیان؛ بەرشکس بوون ⊠ ١. شکست خوردن درجنگ یا معاملە ٢. ورشکست شدن

**تێشکاندن / têş(i)kandin/:** چاوگ. ١. بەزاندن؛ بن خستن لە شەڕ یان لە سەودا و مامەڵەدا ٢. تێکشکاندن ‹سەیلی هیجرەت، بەردی بنچینەی لە ڕەگ هێنامە دەر/ باری فیکرت، قەددی ڕاستی تێشکاندم وەک فەنەر «نالی»› ⊠ ١. شکست دادن ٢. زیان رساندن

**تێشکاو / têş(i)kaw/:** ناوەڵناو. تێشکیاگ: ١. ژێرکەوتوو لە شەڕدا ٢. زەرەر لێکەوتوو لە سەودادا ٣. هەڵشکاو؛ نابووت ⊠ ١. شکستخوردە ٢. زیان دیدە در معاملە ٣. ورشکستە

**تێشکیاگ / têşikyag/:** ☜ **تێشکاو**

**تێشکیان / têşikyan/:** ☜ **تێشکان**

**تێشوو / têşû/:** ناو. تۆشە؛ بژێوی سەفەر ‹بەلام من لەسەر عاشقانی پێشووم/ تەشوێی سیاسەت بووە بە تێشووم «پیرەمێرد»› ⊠ توشە

◘ **تێشوو کردن:** ١. پێکهێنانی بژێو بۆ سەفەر ٢. تێشت خواردن ⊠ ١. آمادە کردن توشە ٢. صبحانە خوردن

**تێشووبەرە / têşûbere/:** ناو. ١. نانبەری جووتیار بۆ دەشت ٢. تۆشەبەرە؛ تۆشەدان ⊠ ١. کسی کە غذای دروگر را برایش میبرد ٢. توشەدان

**تێشوودان / têşûdan/:** ناو. تۆشەدان؛ تۆشەبەرە ⊠ توشەدان

**تێشووک / têşûk/:** ناو. شتومەک؛ کەلپەل ⊠ اثاثیە

**تێشە / têşe/:** ناو. تێشوو؛ تۆشە ⊠ توشە

**تێشیشان / têşîşan/:** چاوگ. تێشیشیان؛ بە پەلەپەل خەریکی کارێک بوون (زۆرتر بە نارەوا) ⊠ شتابان بە کاری (بیشتر ناروا) پرداختن

**تێشیشیان / têşîşyan/:** ☜ **تێشیشان**

**تێغ / têğ/:** ☜ **تیغ**

**تێغە / têğe/:** ☜ **تیغە**

**تێغەرە / têğere/:** ناو. بڕبڕاگە؛ ئەستوونی مۆرە ⊠ ستون فقرات

**تێفکرین / têfikrîn/:** چاوگ. بیر (لێ)کردنەوە؛ تێرامان ‹موو سونبولی ئاشوفتە، دوڕدانەیی ناسوفتە/ دەم غونچەیی نەشگوفتە، تێفکرە کورە یا کچ؟ «نالی»› ⊠ اندیشیدن

**تێڤۆک / têvok/:** ناو. چۆلەکە؛ مەلیچک ⊠ گنجشک

**تێقڵماندن / têqiłmandin/:** ☜ **تێقوڵپاندن**

**تێقوڵپاندن / têqulpandin**/: چاوگ. تێقلماندن؛ لە سەرەوە تێڕژاندن؛ تێدا قلْپ کردنەوە ☰ از بالا ریختن در چیزی

**تێقوچاندن / têqûçandin**/: چاوگ. بە پڕتاو هەڵاتن و خۆ دەرباز کردن ‹مستێکی پێ گەیاند و تێیقووچاند!› ☰ بەسرعت گُریختن

**تێقولاندن / têqûlandin**/: چاوگ. ١. *[مەجاز]* هەڵاتن ‹بە پڕتاو تێیقوولاند!› ٢. هاوار کردن ☰ ١. بە سرعت گریختن ٢. داد کشیدن

**تێک[1] / têk**/: ناوەڵناو. قیت؛ زۆپ ☰ قُد

**تێک[2]**: ناوەڵکار. گش؛ هەموو ☰ همه

**تێک ـ[3]**: پێشگر. ↓

(**تێبینی**١: پێشگری «تێک» ١. دەچێتە سەر چاوگ و چاوگێکی تازە پێک دێنێ ‹تێکخستن› ٢. دەچێتە سەر ڕەگی چاوگ و ئاوەڵناو دروست دەکا ‹تێکخەر› ٣. دەچێتە سەر ناو، دەیکاتە ئاوەڵکار ‹تێکڕا›)

(**تێبینی**٢: «تێک» وێڕای «و»یکی بادانەوەوە هێندێک وشەی لێکدراو پێک دێنێ کە واتایەکی نزیک لە شپرزی و شێواوی دەگرێتەوە. وەک: ‹تێکوپێک؛ تێکولێک؛ تێکومەکان و ...›)

**تێکئاڵان / têk'ałan**/: چاوگ. ئاڵکان؛ ئالقان؛ تێکەڵی یەکتر بوون ‹تێکئاڵانی پرچی ژاندارک و کاکۆڵی عیساکانە «شێرکۆ»› ☰ درهم رفتن

**تێکئاڵاندن / têk'ałandin**/: چاوگ. ئاڵکاندن؛ ئالقاندن؛ تێکەڵ بە یەکتر کردن ☰ درگیر کردن

**تێکئاڵقان / têk'ałqan**/: چاوگ. تێکگیران ‹بووە هۆی شەڕ و تێکئالقان› ☰ درگیر شدن

**تێکئاڵۆزان / têk'ałozan**/: چاوگ. تێکهاڵان؛ تێکەڵاو بوون ☰ درهم شدن

**تێکئاڵۆزاو / têk'ałozaw**/: ناوەڵناو. تێکەڵاو ☰ درهم

**تێکبردن / têkbirdin**/: چاوگ. دە ناو یەک ڕابردن ☰ در هم فرو کردن

**تێکپەڕاندن / têkpeřandin**/: چاوگ. کردنە ناو یەکی دوو یان چەند شت ‹ماینەکەت بۆرە کە ئەکورمێنێ/ ناڵ و دوو بزمار تێکئەپەڕێنێ «فولکلۆر»› ☰ درهم کردن

**تێکپەڕین / têkpeřîn**/: چاوگ. چوونە ناو یەکی چەند شت ☰ قاطی هم شدن

**تێکترنجاو / têkt(i)rincaw**/: ناوەڵناو. ژار؛ هەڵقرچاو ☰ چروکیده

**تێکتەپان / têktepan**/: ☜ **تێکتەپین**

**تێکتەپانن / têktepanin**/: چاوگ. ڕماندن؛ ڕووخاندن ☰ ویران کردن

**تێکتەپاو / têktepaw**/: ☜ **تێکتەپیو**

**تێکتەپین / têktepîn**/: چاوگ. تێکتەپان؛ فەلشان؛ ڕووخان ☰ خراب شدن

**تێکتەپیو / têktepîw**/: ناوەڵناو. تێکتەپاو؛ ڕماو؛ ڕووخاو ☰ ویرانشده

**تێکچرژان / têkçiřjan**/: چاوگ. تێکهاڵان ‹هەڵز و بیزا و گیابەند/ تێکچرژا، بۆتە زممەند «هێمن»› ☰ درهم شدن

**تێکچو / têkçû**/: ناوەڵناو. تێکتەپاو ☰ درهمشده

**تێکچون / têkçûn**/: چاوگ. ١. شێوان؛ لە بەر یەک بلاو بوون ٢. *[مەجاز]* توورە بوون؛ لە باری ئاسایی لادان ☰ ١. آشفتن ٢. برآشفتن

**تێکچوونەوە / têkçûnewe**/: چاوگ. شێوانەوە ☰ آشفتە شدن

**تێکخران / têkx(i)ran**/: چاوگ. ١. بە یەکترەوە بەستران ٢. خزانە ناو یەک ☰ ١. بە هم بستە شدن ٢. در هم ریختن

**تێکخراو / têkx(i)raw**/: ناوەڵناو. بە یەکەوە بەستراو؛ پێکەوە گرێدراو ☰ بە هم بستە شدە

**تێکخستن / têkxistin**/: چاوگ. لێک قایم کردن؛ بە یەکەوە گرێ دان ☰ بە هم گرە زدن

**تێکدان** / têkdan/: چاوگ. ١. خراپ کردن ٢. تێکەڵ کردن ٣. شێواندنەوە؛ هەڵوەشاندنەوە ‹ئەو قەولەی کردت دوێنێ لەگەڵ من/ بۆچی تێکدا، گوێت دا بە دوژمن؟ «فولکلۆر»› ١. خراب کردن ٢. در هم آمیختن ٣. به هم زدن

**تێکدران** / têkd(i)ran/: چاوگ. خراپ بوون در هم ریختن

**تێکدراو** / têkd(i)raw/: ناوەڵناو. هەڵڕووشاو در هم ریخته

**تێکدەر** / têkder/: ناوەڵناو. ١. وێرانکەر ٢. کار خراپ‌کەر ١. ویرانگر ٢. بر هم زن

**تێکردن** / têkirdin/: چاوگ. ١. کردنە ناو؛ دە ناو ڕژاندن ‹بفەرموون ئەی قەدەح‌نۆشان بە ساقی/ لە کووپەی مەعریفەت تێکا ئەویش مەی «بێخود»› ٢. کردنە/ خستنە ناو ‹گەیمە پەنا سەماوەری، جا وەرە تێکە دەو زگەا!/ «دجلە بە دجلە یم بە یم، چشمە بە چشمە جو بە جو» «هەژار، بۆکوردستان»› ٣. داکردن ‹چات بۆ تێکەم؟› ١. ریختن توی ... ٢. در چیزی قرار دادن ٣. ریختن

**تێکردنەوە** / têkird(i)newe/: چاوگ. ١. دیسانەوە تێ کردن ٢. درێژ کردنەوەی داوێن بە قوماش دانە دەم ١. باز ریختن ٢. بلند کردن دامن کوتاه

**تێکڕا** / têkřa/: ناوەڵکار. پێکەوە؛ گش؛ هەمی؛ تێگڕا ‹لە دەوری ئالا، سروودی جێژن/ بە ئاهەنگی بەرز تێکڕا بیێژن «هەژار، بۆکوردستان»› همه با هم

**تێکڕای** / têkřay/: ئامراز. بە هۆی؛ بە بۆنەی بە کمک؛ به وسیله‌ی

**تێکڕایی**[١] / têkřayî/: ناوەڵناو. گش‌لەگش؛ سەرپاک؛ تێگڕایی ‹ویستی تێکڕایی› همگانی

**تێکڕایی**[٢]: ناوەڵکار. گش‌لەگش؛ سەرپاک؛ تێگڕایی ‹تێکڕایی هاتن› همگی

**تێکڕووخان** / têkřûxan/: چاوگ. تێکقرمان؛ ڕۆچوون ریزش کردن

**تێکڕووخاندن** / têkřûxandin/: چاوگ. تێکشێواندن ‹لەپڕ جووولاوە خەڵک و تێکی‌ڕووخاند/ بناخەی کۆشکی ئیستیبدادی یارۆ «هێمن»› درهم کوبیدن

**تێکڕووخاو** / têkřûxaw/: ناوەڵناو. ڕماو؛ هەڕفتی ریزش کرده

**تێکسڕمان** / têksiřman/: ☜ **تێکسمڕان**

**تێکسڕماو** / têksiřmaw/: ☜ **تێکسمڕاو**

**تێکسمڕان** / têksimřan/: چاوگ. تێکسڕمان؛ تیرگۆشت و پتەو بوون درشت بودن

**تێکسمڕاو** / têksimřaw/: ناوەڵناو. تێکسڕماو؛ تیرگۆشتی پتەو درشت بنیه

**تێکشان** / têk(i)şan/: چاوگ. ڕابردنی بە پەلە با شتاب عبور کردن

**تێکشکان** / têkş(i)kan/: چاوگ. بە جارێ بە سەر یەکدا ورد بوون و شکان در هم شکستن

**تێکشکاندن** / têkş(i)kandin/: چاوگ. ورد و خاش کردن بە سەر یەکدا ‹نالی وەکوو زوڵفت کە موتیعی بەری پێتە/ تێکی‌مەشکێنە بە جەفا مەیخەرە لاوە «نالی»› خرد کردن

**تێکشکاو** / têkş(i)kaw/: چاوگ. بە سەر یەکدا شکاو درهم شکسته

**تێکڤەدان** / têkvedan/: چاوگ. تێکدان؛ شێواندن به هم زدن

**تێکقرمان** / têkqirman/: چاوگ. تێکڕووخان ویران شدن

**تێکقژقژان** / têkqijq(i)jan/: چاوگ. بە یەکدا دران و تێک‌هالان ‹ئاپۆرەی خەڵک لەو مەیدانە تێکقژقژابوون› وول خوردن جمعیت

**تێککردنەوە** / têkkird(i)newe/: چاوگ. *[مەجاز]* زۆر خراپ لێ دان و هەموو گیان شکاندن

سخت زدن و استخوان‌ها را شکستن

**تێکگیران** / têkgîran/: چاوگ. ١. دە ناو یەک ترنجان ٢. [کینایە] مل دە بەر ملی یەک نان ☗ ١. درهم فروشدن ٢. در هم آویختن

**تێکگیراو** / têkgîraw/: ئاوەڵناو. ئامباز؛ دەس‌بەیەخە ☗ گلاویز

**تێکلقان** / têkl(i)qan/: چاوگ. بە نێو یەکدا چوون؛ تێک‌پەڕین ☗ در هم فرورفتن

**تێکلهەڤ** / têklihev/: ئاوەڵکار. هەرهەموو؛ تێکرایی بێ هەڵبژاردن ☗ همه؛ بدون استثنا

**تێکنان** / têknan/: چاوگ. پێچانەوە؛ جەم کردن ‹کە بارگەت بۆ هەوار تێکنا عەزیزم/ شکا ئەستوندەکی تاولی مرادم «هێمن»› ☗ جمع کردن اسباب و اثاثیه

**تێکوپێک** / têk û pêk/: ئاوەڵناو. وردوخان؛ بە جارێک خراوکراو. هەروەها: **تێکوپێک دان** ☗ ذرب و داغان

**تێکوتان** / têkutan/: چاوگ. تێ‌کوتانن؛ تێ‌کوتاندن؛ خستنە ناوەوە بە زۆر ☗ چپاندن

**تێکوتاندن** / têkutandin/: ☜ **تێ‌کوتان**

**تێکوتانن** / têkutanin/: ☜ **تێ‌کوتان**

**تێکوشین**[1] / têkuşîn/: چاوگ. تێ‌خستن؛ ورد کردنە ناو شتێ ☗ خرد کردن و در چیزی ریختن

**تێکوشین**[2]: ناو. تریت؛ تلیت: ١. تێکوشیو؛ نان ولین لە شۆربادا ٢. دوغرەمە؛ دوغورمە؛ دۆغورمە ☗ ١. ترید ٢. سالاد خیار و ماست

**تێکوشیو** / têkuşîw/: ناو. تلیت؛ تریت ☗ ترید

**تێکولێک** / têk û lêk/: ئاوەڵناو. کەس‌لەکەس ☗ آشفته

**تێکوڵ** / têkuł/: ☜ **تویکڵ**

**تێکومەکان** / têk û mekan/: ناو. ↓

◘ **تێکومەکان دان**: تێک‌ڕووخاندن؛ کاول کردنەوە ‹... شاروخ لە زانست و زانایان خۆشی دەهات؛ ئەم شوێنەی بۆ ئەستێرەناسان دروست کرد. مەلایان گوتیان کوفرە و حەشامەتیان دوای خۆیان دا و تێکومەکان درا!«هەژار، چێشتی مجێور»› ☗ ویران کردن

**تێکوەدان** / têkwedan/: چاوگ. تێکدان؛ ڕووخاندن ☗ خراب کردن

**تێکوەردان** / têkwerdan/: چاوگ. شێواندن ☗ هم زدن

**تێکۆشان**[1] / têkoşan/: چاوگ. تێکۆشین؛ تەقالا کردن؛ هەوڵدان ‹ڕۆژ و ئەرز و مانگ وا لە گەڕایە / تۆش تێ‌بکۆشە تا هێزت تیایە «بێکەس»› ☗ کوشیدن

**تێکۆشان**[2]: ناو. کۆشش؛ تەقالا ☗ کوشش

**تێکۆشەر** / têkoşer/: ئاوەڵناو. هەوڵدەر؛ تەقالادەر ‹بۆنی ڕزگاریت لە شیعری دێ، چ جوانت هۆندەوە/ ئەی هەژار! ئەی شاعیری تێکۆشەری ناوداری کورد! «هێمن»› ☗ تلاشگر

**تێکۆشین** / têkoşîn/: ☜ **تێکۆشان**[1]

**. تێکەر** / -têker/: پاشگر. ـ دەناوڕێژ ‹چایی‌تێکەر؛ ئاوتێکەر› ☗ ـ ریز

**تێکەلێکە** / têkelêke/: ناو. ئاژاوە؛ بشێوی ☗ هرج‌ومرج

**تێکەڵ**[1] / têkeł/: ئاوەڵناو. تێکەلاو؛ تەڤلهەڤ؛ لێکدراو؛ ئاوێتە ‹وەک بێدل ئەلێ حەیفە کەوا ساکنی باغی/ بولبول لە دلت دەرئەکەوێ تێکەلی زاغی «بێخود»› ☗ آمیخته؛ قاطی

◘ **تێکەڵ بون**: ١. لێکدران؛ بە ناو یەکدا چوون ‹جاروبارە خوێن دەدەلێ و دێتەوە سۆ/ خوێن و گل تێکەلە هانامە بە تۆ «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ٢. [کینایە] جووت بوونی نێر و مێ ☗ ١. درهم آمیختن ٢. آمیزش کردن

**تێکەڵ دان**: تەڤلهەڤ کرن؛ لێکدان بە دار یان کەوچک ‹ئارد و شیرەکە تێکەل دە!› ☗ به هم

زدن

**تێکەڵ کردن**: ئاوێتـە کـردن؛ لێکـدان؛ ئامێتـە کـــردن ‹دەم لـــە دەم نـــانی ڕەقیبـــانی چ بێمروەتییە/ تێکەڵی ئاوی دەباخانـە دەکـا ئـاوی حـەیات «مـەحوی»› 🇮🇷 قـاطی کـردن؛ مخلـوط کردن

**تێکەڵ**[٢]: ئاوەڵکار. لە ناو یەکدا ‹تێکەڵ دەیفرۆشـم› 🇮🇷 درهم

**تێکەڵاو** / têkeław/: ☜ **تێکەڵ**[١]

**تێکەڵاوکراو** / têkeławk(i)raw/: ئاوەڵناو. هەڕەمـە 🇮🇷 آمیخته

**تێکەڵاوی** / têkeławî/: ☜ **تێکەڵی**

**تێکەڵ پێکـــــەڵ**[١] / têkełpêkeł/: ئاوەڵـــــناو. بـێسـەرەوبەرە؛ هەڵشـێواو؛ شـێواو ‹نووسـراوەی تێکەڵ‌پێکەڵ› 🇮🇷 درهم برهم

**تێکەڵ پێکەڵ**[٢]: ئاوەڵکار. بێسـەرەوبەرە؛ هەڵشـێواو ‹تێکەڵ‌پێکەڵ دەنووسێ› 🇮🇷 آشفته

**تێکەڵ پێکـەڵی** / têkełpêkełî/: نـاو. هەڵشـێواوی؛ شپرزی 🇮🇷 نامرتبی

**تێکەڵـدان** / têkełdan/: چـــاوگ. شـــێواندن؛ کەرچلاندن 🇮🇷 قاطی کردن

**تێکەڵدراو** / têkełd(i)raw/: ئاوەڵناو. هەڵشـێواو 🇮🇷 درهم‌برهم

**تێکـەڵکراو** / têkełk(i)raw/: ئاوەڵـناو. هامیتـــە؛ لێکدراو 🇮🇷 آمیخته

**تێکەڵ و پێکەڵ** / têkeł û pêkeł/: ئاوەڵناو. نارێـک؛ نەتەکووز 🇮🇷 نامرتب

**تێکەڵە** / têkełe/: ناو. ١. بەرهەمی دوو یان چەند ماکی تێکەڵ کراو ٢. وردە بەرد و ڕەڵـم پێکـەوە 🇮🇷 ١. مخلوط ٢. مخلوط شن و ماسه

**تێکەڵی** / têkełî/: ناو. تێکەڵاوی: ١. تەفـلهەڤـی؛ شـــپرزی ٢. ئاوێتــــەیی؛ ئامێتــــەیی ٣. *[مـەجاز]* دۆستایەتی و خزمایەتی ٤. نزیکی؛ دۆخی نزیـک بـوونی نێـر و مـێ 🇮🇷 ١. آشفتگی ٢. آمیختگـی ٣. دوستی و خویشاوندی ۴. آمیزش

**تێکـەوتن** / têkewtin/: چـاوگ. ١. کەوتنـــە ناوەوە ٢. ژێر کەوتن و تێشـکان لـە وازیـدا ٣. *[کینایە]* مەلە کردن بۆ لابردنی لەش‌پیسی ٤. بە هـۆی ڕوودەربایسـی یـا نەزانییـەوە تووشـی کارێک بوون 🇮🇷 ١. افتادن در چیزی ٢. بـاختن ٣. غُسل کردن ۴. از رودربایستی یا بی‌اطلاعی داخـل کاری شدن

**تێکەولێکـە** / têke w lêke/: نـاو. بەرهەڵـدایی؛ بێسەرەوبەرەیی؛ کەس‌لەکەسی 🇮🇷 بلبشو

**تێکـەوە ــ** / têkewe-/: پێشـگر. دە نێـــو یـــەک/ یەکترەوە ‹تێکەوەگلان› 🇮🇷 در یکدیگر

**تێکەوەپێچان** / têkewepêçan/: چاوگ. بار و بنـە پێچانەوە ‹بارگەیان تێکەوەپێچاوە بەڕێ بوون یاران/ لە دنێ وا بە تەنێ پاشی ئەوان من چبکەم؟ «هێمن»› 🇮🇷 بار و بندیل بستن

**تێکـــــــەوەدان** / têkewedan/: چـــــــاوگ. تێکەوەهاویشتن؛ بە نارێکی و پەرێشانی هـاتن و چوون 🇮🇷 پریشان قدم زدن

**تێکـەوەگلان** / têkeweg(i)lan/: چـاوگ. بەلشـین؛ پێک‌هەڵپڕژان 🇮🇷 گلاویز شدن

**تێکەوەهاویشـــــــتن** / têkewehawîştin/: ☜ **تێکەوەدان**

**تێکهـاڵان** / têkhałan/: چـاوگ. تێـک‌ئاڵـۆزان؛ لێک‌هاڵان 🇮🇷 در هم شدن

**تێکهاڵانـدن** / têkhałandin/: چـاوگ. ئاڵکانـدن؛ ئاڵۆز کردن 🇮🇷 درگیر کردن

**تێکهـاڵاو** / têkhaław/: ئاوەڵـناو. ١. لێـک‌هـاڵاو؛ تێک‌ئاڵۆزاو ٢. ئاڵۆز؛ ئامباز؛ گرژن 🇮🇷 ١. درهم برهم ٢. سردرگُم

**تێکهەڕستن** / têkheřstin/: چاوگ. بە توندی پـاڵ پێکەوە دان 🇮🇷 محکم به هم تکیه دادن

**تێکهەژیان / têkhejyan/**: چاوگ. لێک هاڵان بە بزووتنەوە  بە هم پریدن

**تێکهەڵچو / têkhełçû/**: ئاوەڵناو. دەس‌بەیەخە  گلاویز

**تێکهەڵچوون / têkhełçûn/**: چاوگ. پێک‌هەڵپڕژان و تێکەوە گلان بۆ شەڕ  گلاویز شدن

**تێکهەڵدان / têkhełdan/**: چاوگ. ١. شەڕەشەق کردن؛ بە پێ و ... لە یەک دان ٢. شەڕ کردنی ئاژەڵ بە شاخ  ١. (با لگد و تیپا) بە جان هم افتادن ٢. شاخ بە شاخ شدن حیوانات

**تێکهەڵشێلان / têkhełşêlan/**: چاوگ. بە سەر یەکدا هەویر کردن؛ دوو دەرمان پێکەوە تێکەڵ کردن و شێلان  معجون کردن

**تێکهەڵشێلدراو / têkhełşêld(i)raw/**: ئاوەڵناو. تەفلهەف؛ تێکەڵ‌پێکەڵ؛ لێکدراو  درهم آمیخته

**تێگرتن / têgirtin/**: چاوگ. ١. بەرەو نیشانە هاویشتن ‹لە پاداشی قسەی سەردا هەمە ئاه و هەناسەی گەرم/ کەسێ شێتانە بەردم تێگرێ، من بەرقی تێدەگرم «مەحوی»› ٢. پینە بە بەرگدا دروون ٣. بە شتێ، بەر بە ڕەوتێ گرتن (وەک: بەرد دە کوون و ڕەهۆڵ نان) ٤. پێداگرتن؛ بەرگ گرتن  ١. هدف‌گیری کردن ٢. پینە زدن ٣. فرایندی را متوقف کردن ٤. جلد گرفتن

**تێگرتنەوە / têgirt(i)newe/**: چاوگ. سەرلەنوێ تێهەڵکردنەوە؛ هاویشتنی دووبارە  دوبارە پرتاب کردن

**تێگرماندن / têgirmandin/**: چاوگ. لێ‌خوڕین؛ تێخوڕین  نهیب زدن

**تێگرا / têgřa/**: ☜ تێکرا

**تێگرایی / têgřayî/**: ☜ تێکرایی

**تێگوشین / têguşîn/**: چاوگ. تێکوشین؛ تێوشین؛ تێوڵین؛ نان تریت کردن  ترید کردن

**تێگەشتن / têgeştin/**: ☜ تێگەیشتن

**تێگەیاندن / têgeyandin/**: چاوگ. ١. حاڵی کردن ٢. سەرنجی کەسێ ڕاکێشان و هێنانە ناو کارێ  ١. متوجە کردن ٢. پای کسی را بە کاری کشیدن

**تێگەیشتن / têgeyiştin/**: چاوگ. تێگەشتن؛ تێگەیین؛ حاڵی بوون ‹عومرێکە بە میزانی ئەدەب توحفە فرۆشم/ زۆرم وت و کەس تێی‌نەگەیی، ئێستە خەمۆشم «نالی»›  فهمیدن؛ دریافتن

**تێگەیشتو / têgeyiştû/**: ئاوەڵناو. تێگەیشتی؛ تێگەیو؛ فامیدە؛ حاڵی‌بووگ ‹خوایە بۆمان بنێری ئاوی لە قوڕ نەنیشتوو/ یان لاوی پێگەیشتوو یان پیری تێگەیشتوو «وەهبی»›  فهمیدە

**تێگەیشتویی / têgeyiştûyî/**: ناو. ئاوەزمەندی؛ توانستی تێگەیشتن  فهم؛ درایت

**تێگەیشتی / têgeyiştî/**: ☜ تێگەیشتو

**تێگەیو / têgeyîw/**: ☜ تێگەیشتو

**تێگەیوی / têgeyîwî/**: ناو. دەسکەوت  برداشت

**تێگەیین / têgeyîn/**: ☜ تێگەیشتن

**تێگیران / têgîran/**: تێ‌گیریان؛ گیر کردن: ١. گیر کردن لە شتێک ٢. لە ناو شتێک یان لە دۆخێکدا تووش بوون  ١. گیر کردن ٢. درگیر شدن

**تێگیراو / têgîraw/**: ئاوەڵناو. هەڵقاو؛ گیرخواردوو (لە شتێکدا)  گیر کردە (درچیزی)

**تێگیریان / têhîryan/**: ☜ تێ‌گیران

**تێل[1] / têl/**: ناو. ١. سیم؛ تەل؛ ڕێسە یان هەودای نەرم لە کانزا و پتر پۆشەندار بۆ کاری جۆراوجۆر (وەک گواستنەوەی کارەبا یان ئیلیکترۆمیغناتیس)، کە لە کانزا و بە کۆتەری جیاواز و پتر بە پۆشەنێکی بەرگرەوە چێ دەکرێ ٢. بەرقییە؛

بڕووسکە؛ تێلگراف؛ ئامێرێکی پێوەندی بۆ ناردن و وەرگرتنی پەیام لە ڕێگای دوورەوە، بە شێوەی گواستنەوەی کارەبایی، کۆد و نیشانە ‹بۆ بەغدا دایان لە تێل/ بۆ خزمەت خواجە میشێل! «هەژار، بۆ کوردستان»› ☰ ۱. سیم ۲. تلگراف

**تێل**[۲]: ناوەلناو. ۱. ئامالْخوار؛ تۆزێ لار ۲. لووس؛ ساف ☰ ۱. کج؛ مایل ۲. صاف

**تێلدڕوو** / têld(i)řû/: ☜ **تەلدڕوو**

**تێلگراف** / têlg(i)raf/: ناو. بەرقییە؛ بڕووسکە؛ تێل؛ تەل ☰ تلگراف

**تێلە** / têle/: ☜ **ڕەشباو**

**تێلەکە** / têleke/: ناو. کۆڵ؛ کۆڵەپشت؛ تێلەگە ☰ کولەپشتی

**تێلەکە پووشکە** / têlekepûşke/: ناو. کۆرەدار ☰ پُشتەی هیزم

**تێلەکێش** / têlekêş/: ناوەلناو. ناوەکێش ☰ ناوەکِش

**تێلەگە** / têlege/: ☜ **تێلەکە**

**تێلیسان** / têlîsan/: ناو. تەیلەسان: ۱. قایشێکە وەک پێشی شەپکە، بۆ خۆ پاراستن لە تیشکی خۆر بە نێو چاواندا دەیبەستن ۲. بەرگێکی وەکوو عابا کە کڵاوێکی پێوە لکاوە و زۆرتر کەشەکان دەبەری دەکەن ☰ ۱. سایەبانی مانند لبەی کُلاە ۲. طَیلسان

**تێڵ** / têł/: ناو. توێڵ؛ هەنیە؛ ئەنی؛ ناوچاوان ☰ پیشانی

**تێلا** / têła/: ناو. پەیاغ؛ چۆماغ؛ داردەستی ئەستوور؛ داردەستی پتەو و سەر بەگرێ ☰ چُماق

**تێلاتڕێن** / têłat(i)řên/: ناو. دارکاری خەست و خۆڵ ☰ عمل با چُماق به شدت زدن

**تێلاکوت** / têłakut/: ناوەلناو. چێوکوت ☰ چوبکاری شدە

**تێڵە** / têłe/: ☜ **ڕەشباو**

**تێمان** / têman/: چاوگ. دامان؛ ڕامان؛ تێدامان؛ سەرگەردان بوون ☰ درماندن؛ فروماندن

**تێماو** / têmaw/: ناوەلناو. داماو؛ تێداماو ☰ درماندە

**تێماوی** / têmawî/: ☜ **داماوی**

**تێمرووکان** / têm(i)rûkan/: چاوگ. تێوروژان؛ تێورووکان؛ کۆ بوونەوە بە دەوری شتێکدا ☰ گرد آمدن

**تێموم** / têmum/: ناو. کار و ڕەوتی دەسنوێژ گرتن بە تۆز لە باتی ئاو ☰ تیمم

**تێمیسک** / têmîsk/: ☜ **تامیسك**

**تێمێسک** / têmêsk/: ☜ **تامیسك**

**تێن**[۱] / tên/: ناو. تین؛ تن؛ تاو؛ گەرما ☰ حرارت

**تێن**[۲]: ☜ **تینوو**[۲]

**تێنان** / tênan/: چاوگ. خستنە ناو؛ ئێخستنە هوندۆر؛ لە دوڕنان ☰ فروکردن

**تێنراو** / tên(i)raw/: ناوەلناو. *[ئاشیرین]* گایاو؛ گایاگ؛ پێوە کراو ☰ گاییدە شدە

**تێنوارە** / tênware/: ناوەلناو. هەلوەدا؛ ئاوارە؛ بێ‌ماڵ؛ ڕەبەن ☰ آوارە

**تێنوارین** / tên(i)warîn/: چاوگ. تواشا کردن؛ لێ‌نهێرین ☰ تماشا کردن

**تێنوو** / tênû/: ☜ **تینوو**[۲]

**تێنووس** / tênûs/: ناو. دەفتەر ☰ دفتر

**تێنەپەڕ** / tênepeř/: ناوەلناو. *[ڕێزمان]* تایبەتمەندی کردارێ کە بەرکاری پێویست نییە. بەرانبەر: **تێپەڕ** ☰ لازم

**تێنەوین** / tênewîn/: چاوگ. داهاتنەوە بۆ هەلگرتنی بار ☰ خم شدن برای برداشتن بار

**تێنیشتن** / tênîştin/: چاوگ. ۱. *[مەجاز]* دەست بە کارێ کردن ۲. سواری (جۆلانە) بوون؛ لە (جۆلانە) نیشتن ☰ ۱. دست بە کار شدن ۲. در (تاب) نشستن

**تێوروژان** / têw(i)rûjan/: ☜ **تێمرووکان**

**تێورووکان** / têw(i)rûkan/: ☜ **تێمرووکان**

**تێوشین / têw(i)şîn/**: ☜ **تێ گوشین**

**تێوڵدار / têwiłdar/**: ئاوەڵناو. بەختەوەر؛ بەختیار ■ خوشبخت

**تێوڵە / têwłe/**: ناو. ١. ☜ **تەوێڵە** ٢. پۆ؛ هەواڵی تان ■ ١. ☜ **تەوێڵە** ٢. پود

**تێوڵین / têw(i)łîn/**: ☜ **تێ گوشین**

**تێوە ـ / -têwe/**: پێشگر. دەنێو ـ ؛ دەنێوەوە ـ ■ از میان

**تێوەپێچان / têwepêçan/**: چاوگ. لێ هاڵاندن ■ پیچاندن به دور چیزی

**تێوەتلاندن / têwet(i)landin/**: چاوگ. تێوەگلاندن؛ تووشی کارێ کردن ■ درگیر کاری کردن

**تێوەتلاو / têwet(i)law/**: ئاوەڵناو. /کینایە/ ئارۆدە؛ گەنەکار؛ خراپە ■ بدکاره

**تێوەچوون / têweçûn/**: چاوگ. ١. کەوتنە ناو شلی ناتەمیسەوە ٢. پێوەنووسان؛ پیەو تلیان ■ ١. فرو شدن ٢. آغشتن

**تێوەدان / têwedan/**: چاوگ. ١. ئاوێتە کردنی کەم لە زۆر ٢. هەڵسوان؛ ساوین ٣. /کینایە/ ئالوودە کردن ‹خۆی قوڕاوی بوو، منیشی تێوەدا› ٤. پۆ دە ڕایەڵ هەڵکێشان ■ ١. آمیختن کم با زیاد ٢. ساییدن ٣. آلودن ۴. پود در تار کشیدن

**تێوەدراو / têwed(i)raw/**: ئاوەڵناو. شەلاڵ ■ آغشته

**تێوەدراوی / têwed(i)rawî/**: ناو. شەلاڵی ■ آغشتگی

**تێوەردان / têwerdan/**: چاوگ. ١. لێکدان؛ تێکوەردان ٢. پێدا دان؛ ئاو یان تراوی تر دە دەفر گەڕاندن بۆ خاوێنی ٣. شەریک کردن لە کار یا ڕەوتێک ‹ئەویشیان تێوەرداوە› ■ ١. بهم زدن ٢. آب یا مایعی را در ظرف گرداندن ٣. آلودەی کاری کردن

**تێوەرهاتن / têwerhatin/**: چاوگ. داوەرووکان؛ لە سەر شتێ کۆ بوونەوە و کەڵەکە کردن ■ گرد هم آمدن

**تێوەرێخ / têweřêx/**: ناو. داوی پۆی جۆلایی کە لە نێو ماسوولەدایە ■ ریسمان و نخ پود جولایی

**تێوەژان / têwejan/**: چاوگ. نەقیزە تێڕۆکردن ■ سیخونک زدن

**تێوەژاندن / têwejandin/**: چاوگ. نەقیزە دان ■ سیخونک زدن

**تێوەژەندن / têwejendin/**: چاوگ. نەقیزە کوتان ■ سیخونک زدن

**تێوەشان / têweşan/**: چاوگ. ١. کاری وەک ڕاوەشاندنی جلک لە تەندووردا بۆ مۆرانە کوشتن ٢. بە نارەوا دەست بۆ بردن ■ ١. لباس بر آتش گرفتن ٢. تصاحب کردن

**تێوەشاندن / têweşandin/**: چاوگ. کاری لە چەشنی جلک بە ئاگر ڕاداشتن بۆ مۆرانە کوشتن ■ لباس بر آتش گرفتن

**تێوەکردن / têwekirdin/**: چاوگ. دە ناو نان ■ چپاندن

**تێوەگلان / têweg(i)lan/**: چاوگ. تووش بوون بە کارێک لە خۆڕایی ■ درگیر شدن

**تێوەگلاندن / têweg(i)landin/**: چاوگ. گیرۆدە کردن بەبێ ڕازی بوون ■ درگیر کردن

**تێوەگلاو / têweg(i)law/**: ئاوەڵناو. تێکەڵاو ■ آغشته

**تێه / têh/**: دەنگ. تەح؛ تەحا؛ وشەی سەیر مان وە؛ حرف تعجب

**تێهاتن / têhatin/**: چاوگ. ١. هاتنە ناو ٢. تێڕژان ■ ١. تو آمدن ٢. تو ریختن

**تێهاڵان / têhałan/**: چاوگ. هەنگژان ■ دور چیزی پیچیدن

**تێهاڵاو / têhaław/**: ئاوەڵناو. لێهاڵاو ■ در چیزی

پیچیده شده

**تێهانین** / têhanîn/: چاوگ. *[مەجاز]* بەخت هێنان؛ هەل بۆ ڕەخسان ⯀ شانس آوردن

**تێهەڵچوون** / têhelçûn/: چاوگ. ١. پێداچەقان؛ پیا چەقیان ‹ڕجاتان لێ دەکەم ئەی خزم و یاران!/ کە زوو تێهەڵنەچین وەک جاری جاران «بێکەس»› ٢. چوونە ناو بۆ کارێک ⯀ ١. خلیدن ٢. وارد کاری شدن

**تێهەڵچوونەوە** / têhelçûnewe/: چاوگ. بە سەر گرتنەوە؛ سەرلەنوێ کردنەوە ‹بە کوردی دیسان زیندوو دەبمەوە/ لەو دنیاش بۆ کورد تێهەڵدەچمەوە «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ⯀ از سر گرفتن

**تێهەڵچەقان** / têhelçeqan/: چاوگ. تێهەڵچەقین؛ پێداچەقین ⯀ خلیدن

**تێهەڵچەقاندن** / têhelçeqandin/: چاوگ. پێداچەقاندن ⯀ خلانیدن

**تێهەڵچەقین** / têhelçeqîn/: ☜ **تێهەڵچەقان**

**تێهەڵدان** / têheldan/: چاوگ. ١. بە شەق لە یەکێک دان ‹کلکێکی پێوە کرد و بەرەو ژووری ژووری بردا/ تێی‌هەڵدەدا شەقێک و سەرەو ژێری ژێری کردا! «مەحوی»› ٢. دۆڵچە یان دەفر دە ئاو و ... ڕاکردن بۆ ئاو هەڵێنجان ⯀ ١. تیپا زدن ٢. آب برکشیدن

**تێهەڵڕوانین** / têhelř(i)wanîn/: چاوگ. پێداهەڵڕوانین ⯀ چیزی را از پایین نگاه کردن

**تێهەڵساوین** / têhelsawîn/: چاوگ. تێهەڵسوون؛ پێداساوین؛ پیامالین ⯀ مالیدن؛ اندودن

**تێهەڵسووران** / têhelsûřan/: چاوگ. مەفلین؛ ڕەنگ کران ⯀ اندوده شدن

**تێهەڵسوون** / têhelsûn/: ☜ **تێهەڵساوین**

**تێهەڵقوتان** / têhelqutan/: چاوگ. *[مەجاز]* تێهەڵقورتان؛ لاپرەسەنی کردن؛ خۆ تێ کوتان؛ لە خۆوە خۆ دە کار گەیاندن ⯀ فضولی کردن

**تێهەڵقورتان** / têhelqurtan/: ☜ **تێهەڵقوتان**

**تێهەڵکردن** / têhelkirdin/: چاوگ. ١. بە قەو دەنگ هەڵێنان لە گۆرانی ٢. تێ گرتن؛ ئاوقە کردن ⯀ ١. آواز سر دادن ٢. هدف قرار دادن

**تێهەڵکەوتن** / têhelkewtin/: چاوگ. ١. بە تاسەوە مژ لە مەمکی دایک دان ٢. هەبوون و دەرکەوتنی دیاردەیەک ‹کوردستان کێوی زۆری تێهەڵکەوتووە› ⯀ ١. با اشتیاق مُک به پستان مادر زدن ٢. پدید آمدن

**تێهەڵکێش** / têhelkêş/: ناو. ١. کاری خستنە ناو یەکترەوە ٢. شیعرێک بە پێشوازی، دە ناو شیعری کەسی تردا ⯀ ١. عمل لای چیزی گذاشتن ٢. تضمین

**تێهەڵکێشان** / têhelkêşan/: چاوگ. ١. داو یان هەر شتێ دە ناو شتێکی تر خستن ٢. دە ناو تراو نان و هێنانەوە دەر ⯀ ١. لای چیزی گذاشتن ٢. غوطەور کردن و درآوردن

**تێهەڵەنگان** / têhelengan/: چاوگ. تێهەڵەنگووتن؛ هەڵتەقین بە شتێکدا و ساتمە پێبردن ⯀ سکندری خوردن

**تێهەڵەنگووتن** / têhelengûtin/: چاوگ. ١. ☜ **تێهەڵەنگان** ٢. هەڵتەقین؛ لەپڕ تووش بوون ⯀ ١. ☜ **تێهەڵەنگان** ٢. ناگهانی مواجه شدن

**تێهەڵێنان** / têhelênan/: چاوگ. قەرەبوو دانەوە؛ پڕ کردنەوەی زیان ⯀ تلافی کردن

**تێهەڵێنانەوە** / têhelênanewe/: چاوگ. قەرەبوو کردنەوە؛ بۆ بژاردنەوە ⯀ تلافی کردن

**تێهێنان** / têhênan/: چاوگ. هەل بۆ ڕەخسان و سەرکەوتن لە کارێکدا ⯀ خوب آوردن

# ج

**ج** / c/: پیت. نیشانەی شەشەمین پیتی ئەلفوبێی زمانی کوردی ج؛ نشانەی ششمین حرف الفبای زبان کُردی

**ج** / ci/: ناو. ناوی شەشەمین پیتی ئەلفوبێی زمانی کوردی ج؛ ششمین حرف الفبای زبان کُردی

**جا**[1] / ca/: ناو. ١. جێ؛ جێگە؛ جێگا ‹هەر کاتێ زانای فەڵەک نەردێ شەند/ وێنەی هامجامان جامان وە جا مەند «مەولەوی»› ٢. شکۆ؛ شان؛ مەزناهی ٣. جاگە؛ نوێن؛ جێگەوبان ‹شەش ماه تەمام وەبان جا بی/ عاقبەت دەوای دەردش فەنا بی«شامی»› ١. جای ٢. جاه ٣. رختخواب؛ بستر

▣ **جا نسته**: بەجێ مان جا ماندن

**جا نسمه**: جێ هێشتن جا گذاشتن

**جا**[2]: ئاوەڵکار. ١. ئەوسا؛ ئەو کاتە ‹با ئەو بگەڕێتەوە، جا تۆ بچۆ› ٢. وشەی پرسیار ‹جا وا نییە؟ جا تۆ هێشتت؟› ٣. کاتێ؛ وەختێ ‹جا کە هاتم پێت دەڵێم› ٤. مەگەر ‹جا ناچی؟› ١. آنگاه؛ سپس ٢. آخر؛ آیا ٣. وقتی؛ زمانی ۴. مگر

**ـ جا**[3]: پاشەوشە. ١. ـ جاو؛ جاکێن ‹جاجگ‌جا› ٢. جێ؛ شوێن؛ ‹چیت‌جا› ١. ـ خا ٢. جا؛ مکان

**جا**[4]: ئامراز. ١. سا؛ کەوابوو؛ کەوایە ‹جا با بێ› ٢. بۆ تێڕامان ‹جا وتت!› ٣. نیشانەی پێداگری ‹جا کار وا دەکرێ؟› ٤. ئەگەر ‹جا باران نەبارێ، چ بکەین؟› ٥. وشەی گەڤ یا ئاگەداریی ‹جا بزانە چت لێ دەکەم؟!› ٦. مەگەر ‹جا شتی وا دەبێ؟› ٧. بەڕاستی ‹جا ئەگەر من نەبوایام، تۆ چت پێ دەکرا؟› ١. پس ٢. ای ٣. آخر ۴. اگر ۵. حال؛ حالا ۶. مگر ٧. به راستی

**جائاستە** / ca'aste/: ئاوەڵناو. جێماو؛ بەجێماو؛ دواکەوتوو جامانده

**جاب** / cab/: ☜ **جواب**

**جابڕکە** / cabiřke/: ☜ **جۆبڕ**

**جابە** / cabe/: ناو. ١. دۆڵ؛ شیو ‹بە ڕەشەڕێحانێ کە شین دەبوو لە جابەی دەلەندی «بەیت»› ٢. جەعبە؛ سندۆق ١. درّه ٢. جعبه

**جابەجا** / cabeca/: ئاوەڵکار. دەسبەجێ؛ ڕێوڕ ‹جابەجا نە جەرگ شای نۆفەڵ جا کەرد/ ڕیشەی جەرگ و دڵ جە هەم جیا کەرد «خانای قوبادی»› درجا

**جابیرو** / cabîru/: ناو. باڵندەیەکە لە کۆمەڵەی حاجی‌لەق‌لەق پرندەای از خانوادەی لک‌لک‌ها

**ـ جات** / -cat/: پاشگر. ـ ات؛ ـ وات؛ ـ ەمەنی؛ پاشگری دەستە و جۆر ‹سەوزیجات؛ میوەجات› ـ جات

**جاترۆک** / cat(i)rok/: ☜ **جاترە**

**جاتره** / cat(i)re/: ناو. جاترۆک؛ جەهتەر؛ نەعناکێویلە؛ پوونگەکێویلە؛ پوونگەڕێوی؛ تهتاوک؛ تهتاڤک؛ تەهتاڤک؛ تەتاڤک؛ ڕووەکێکی کێوی خۆڕسکە، گەڵاکانی بۆنی نەعنا دەدەن ☚ نعنای کوهی

▣ **جاترەی ئەسپ**: چەوەنە؛ ڕێحانەکێویلە؛ سەرەچۆلەکە ☚ گیاهی است

**جاترەکێویلە** / cat(i)rekêwîle/: ناو. جاترەمە؛ هەزبۆکێفیلە؛ نەعنا کێوی ☚ مرزەی کوهی

**جاترەمە** / cat(i)reme/: ☜ **جاترەکێویلە**

**جاتۆڵ** / catoł/: ناو. داهۆڵ؛ داوڵ ☚ مترسک

**جاتۆڵباز** / catołbaz/: ناوەڵناو. فێڵباز؛ داوباز ☚ حیلەگر

**جاتەنە** / catene/: ☜ **جاڵجاڵۆکە**

**جاجا** / caca/: ناوەڵکار. جارجار؛ جاروبار ☚ گاهگاه

**جاجر** / cacir/: ناو. هەڵوای گوێز و هەنگوین ☚ معجون عسل و گردو

**جاجرم** / cacirm/: ☜ **جاجم**

**جاجک** / cacik/: ☜ **جاچکە**

**جاجکە** / cacke/: ☜ **جاچکە**

**جاجکەتاڵە** / cacketałe/: ☜ **جاچکەتاڵە**

**جاجکەخۆشە** / cackexoşe/: ☜ **جاچکەخۆشە**

**جاجگ** / cacig/: ☜ **جاچکە**

**جاجم** / cacim/: ناو. جاجرم؛ جارجیم؛ تەنراوێک لە مووی ڕێسراو و ڕەنگکراوی بزن، بۆ ڕاخستن ☚ جاجیم

**جاجۆلکە** / cacolke/: ☜ **جاڵجاڵۆکە**

**جاجوو** / cacû/: ناو. نەیار؛ دوژمن ☚ دشمن

**جاجیک** / cacîk/: ناو. کاهووی هەنجناو لە ناو ماستدا ☚ سالاد ماست و کاهو

**جاچک** / caçik/: ☜ **جاچکە**

**جاچکە** / caçke/: ناو. جاجک؛ جاجکە؛ جاجگ؛ جاچک؛ داچکە؛ ژاژک؛ ژاژکە؛ بنێشت؛ بەنووشت؛ شیلەی دارەبەن ☚ سقز

**جاچکەتاڵ** / caçketał/: ☜ **جاچکەتاڵە**

**جاچکەتاڵە** / caçketałe/: ناو. جاچکەتاڵ؛ جاجکەتاڵە؛ بنێشتەتاڵە؛ شیلەی سروشتی (نەکوڵاوی) دارەبەن ☚ سقز تلخ/ خام

**جاچکەخۆشە** / caçkexoşe/: ناو. بنێشتەخۆشە؛ جاجکەخۆشە؛ شیرەی کوڵێنراوی دارە بەن ☚ سقز پُخته

**جاچۆلگەر** / caçolger/: ناو. جادووگەر؛ جاچوولکەر؛ ئەفسوونکار ☚ جادوگر

**جاچۆڵگەر** / caçołger/: ☜ **جادووگەر**

**جاچوولکەر** / caçûlker/: ☜ **جادووگەر**

**جاخ** / cax/: ناو. ۱. دەسکێ لە گەڵای توتن ۲. توورەکە یان کیسەی چکۆلەی پەڕ و توتن کە سیغارکێش هەڵیدەگرێ ۳. تامان؛ چەپەر ٤. زێد؛ ژێگەی منداڵی ٥. قەباڵەی موڵک ٦. ئاگردان ۷. گودلە؛ کاکۆڵی سەر توێڵ ☚ ۱. یک بسته برگ توتون ۲. کیسەی توتون و کاغذ سیگار ۳. پرچین ۴. زادگاه ۵. بُنچاق؛ سند مالکیت ۶ آتشدان ۷. کاکُل

**جاخسووک** / caxsûk/: ناو. داس؛ داساچلو ☚ داس

**جاخۆ** / caxo/: ناوەڵکار. تازە؛ ئەوسا؛ ئەوساکە؛ جا ☚ آن‌وقت

**جادار**[1] / cadar/: ناو. جێ‌نشین؛ جێگر؛ خەلفە ‹جادار ڕەویەی بێسارانی بێ/ ساحیب تەریکەی هادی سانی بێ «داخی»› ☚ جانشین

**جادار**[2]: ناوەڵناو. ۱. بەڕێز و حورمەت ۲. بەجێ و عاقڵانە ☚ ۱. ارجمند؛ والا ۲. بجا؛ معقول

**جادوو** / cadû/: ناو. سیحر؛ جاچۆڵە؛ نیرەنگ؛ جاچۆڵ؛ جاچۆڵ؛ جاچوول؛ کردوکاش بۆ زاڵ بوون بە سەر شت و ڕووداواندا بە ئاکار و ئایینی تایبەتەوە ☚ جادو

◻ **جادوو کردن:** تەلیسم بوون ☰ جادو کردن

**جادووباز / cadûbaz/:** ☜ **جادووگەر**

**جادووبەن / cadûben/:** ناو. جادووبەند؛ نووشتەی جادوو بەتاڵکەر ☰ تعویذ؛ باطل‌کنندەی سحر

**جادووبەند / cadûbend/:** ☜ **جادووبەن**

**جادووکار / cadûkar/:** ☜ **جادووگەر**

**جادووکەر / cadûker/:** ☜ **جادووگەر**

**جادووگەر / cadûger/:** ناو. جادووباز؛ جادووکار؛ جادووکەر؛ جاچۆڵگەر؛ جاچوولکەر؛ ئەفسوونکار؛ سیحرباز؛ چاچۆڵوان؛ نێرەنگ؛ دوایە؛ داوباز؛ تەلەسمباز؛ باربەژنگەر؛ هاررووتی؛ چاچۆڵگەر ‹چاوی فەتتانی ئەتۆ ساحیرە یا جادووگەر؟/ کە بە یەک عیشوە ئەدا عابیدی سەد ساڵە فریب «شێخ ڕەزا»›. هەروەها: **جادووگەری** ☰ جادوگر

**جادە / cade/:** ناو. ١. ڕێگا؛ ڕێگە؛ جاگە؛ کاروانەڕێ؛ ڕەوازێکی رووبازی گشتی، بۆ بگاردنی مرۆڤ، گیانەوەر و کەرستەی هاتوچۆ، لە دەرەوەی شار و دێ ‹وێش جە تاوی دەرد باری خەمان بەرد/ جادەی مەینەت گرت، وێڵ بی هەرد ئەو هەرد «مەولەوی»› ٢. شەقام؛ خیابان ‹گڵۆپەکانی سەر جادە و کۆلان/ زەرد هەڵگەڕابوون، کز-کز ئەسووتان «گۆران»› ☰ ١. جادە ٢. خیابان

**جادەڕێ / cadeřê/:** ناو. شاڕێ؛ شاڕێگە ☰ شاهراه

**جار / car/:** ناوەڵکار. ١. هەل؛ کەڕەت؛ ڕا ‹یاڕەب! بە کەرەم جارێ، لوتف و کەرەمت دەرخە/ لەم سەخت و چڕی چەرخە، ئەم عالەمە زوو سەرخە «ئاوات»› ٢. وەخت؛ کات ‹ئاغا زانی ئەو جارە، ئەو قەندە ژەهری مارە/ پێش‌بینی کاک هەژارە: ئێستا شەق بە خەروارە! «هێمن»› ☰ ١. دفعە؛ بار ٢. گاە؛ هنگام

◙ **جارێ جاران:** بەر لە ئێستا؛ لە پێشوودا؛ ئەوسا ‹ئەگەر ئەوانە پاک بکرێنەوە/ وەک جارێ جاران وا بژێینەوە... «پیرەمێرد»› ☰ پیش از این؛ در گذشتە

**جاران[1] / caran/:** ناو. ئەوسا؛ ڕابردوو ‹با دەسەوملی مەلی بێچاران بێن/ هەر «هەژار-هێمن»ەکەی جاران بێن«هەژار، *بۆکوردستان*»› ☰ گذشتە؛ سابق

**جاران[2]:** ناوەڵکار. ئەوسا؛ بەر لە ئێستا؛ لە کاتی ڕابردوودا ‹جاران پەناگەی شەوانم/ نامێزی ئاوەڵای ژن بوو «هێمن»› ☰ سابقاً

**جاربەجار[1] / carbecar/:** ناوەڵناو. بڕێ جاری؛ هێندێک جاری ‹تۆ دەریامی/ بە تووڕەیی جاربەجارت/ بە شەپۆلی لەنجەولارت «سوارە»› ☰ گاەوبیگاهی

**جاربەجار[2]:** ناوەڵکار. جار لە دووی جار؛ کەڕەت لە دوای کەڕەت ‹بەس نییە لێرە دەوێرم جاربەجار باست بکەم/ نەمدەوێرا قەت لەبەر ئەغیار کە ناوت بەم لەوێ «مستەفا بەگی کوردی»› ☰ هر بار

**جاربەجارێ / carbecarê/:** ناوەڵکار. جاروبار؛ جاروبارە؛ جارنان؛ جارجارە ☰ گاهگاە

**جار ـ جار / car car/:** ناوەڵکار. بە هەڵکەوت ‹شەوگار لە هەرزانترین خان یان لە سەر بانی مزگەوتان، جار - جار لە سەر ڕەڵمی گەرم لە سارایە، زۆر جار لەو کەژ و چیایە، لە ئەشکەوتان، لە سەر بەردان، لە بەر باران و لەنگێزە، ستارم گرتووە و خەوتووم! «هەژار، *بۆکوردستان*»› ☰ گەگُداری

**جارجارە / carcare/:** ناوەڵکار. جارەجارە؛ جارەوجار؛ جار- جار؛ جاروبار؛ لە زۆر کاتاندا کاتێک ‹لە بەزمی حوسنی خۆتا توخودا جارجارە یادم کە/ کە من پەروانەکەی ڕوخساری شەمعی مەجلیس‌ئاراتم «بێخود»› ☰ گاهگاە

**جارجارێ / carcarê/:** ناوەڵکار. بەینابەین ‹ئەڕۆییم و دزەی نیگام جارجارێک/ لە ژێر عابای ڕەشا ئەیدی نازدارێک «گۆران»› ☰ گاهگاهی

**جارجور / carcûr/:** ناو. ساجۆر؛ شارجۆر؛ قاپی

فیشەکان لە چەکی خۆمەش ▤ خشاب

**جارجیم** / carcîm/: ☜ جاجم

**جارس** / caris/: ☜ جارِز

**جارماز** / carmaz/: ☜ جانماز

**جارناجـار** / carnacar/: ئاوەڵکار. جارنـەجار؛ وەخت و بێوەخت ▤ گاه و بیگاه

**جارنان** / carnan/: ☜ جاروبار

**جارنەجار** / carnecar/: ☜ جارناجار

**جاروبـار** / car û bar/: ئاوەڵکار. جاروبـارە؛ جارنان‌جار؛ جارجارە؛ جاربەجارێ ‹ئەو کەسـەی پەنجۆلە بکوشێ جاروبار/ ئەو کەسەی دەستی بگاتە دەستی یار «هێمن»› ▤ گاهگاه

**جاروبارە** / car û bare/: ☜ جاروبار

**جاروفک** / carufk/: ☜ جارِو-١

**جاروەجـارێ** / carwecarê/: ئاوەڵکار. کاتێ لە کاتان ▤ گاهگاهی

**جـارە** / care/: ناو. ١. جاڵە؛ ئوتووز؛ تاوێرەبەرد؛ بەردی گلارەوەبوو لە کێو ٢. ئامرازێکی مووسیقایە ▤ ١. سنگ غلتیده از کوه ٢. از آلات موسیقی

**جارەجارە** / carecare/: ☜ جارجارە

**جارەوجار** / carewcar/: ☜ جارجارە

**جاری** / carî/: ناو. هێوەرژن؛ ژنی برای مێرد ▤ جاری؛ زن برادرشوهر

**جاریـا** / carîya/: ناو. خزمەتکار؛ کلفەت؛ قەرەواش ▤ خدمتکار

**جـارێ** / carê/: ئاوەڵکار. جارێک: ١. هێشتا ‹جارێ ماومە› ٢. بۆ ماوەیەک ‹جارێ مەڕۆ، بەڵکوو ببینی› ▤ ١. هنوز ٢. عجالتاً

▣ **بەجارێ**: ١. بە شێوەی گشتی؛ یەکجاری ‹نە دینم بوو نە دونیا گەر نەکێشی خەت بە دیوانم/ بەجارێ ماڵی‌وێرانم! ئەویشم چوو ئەمیشم چوو «وەفایی»› ٢. پێکەوە؛ بە یەک جار ‹هەمووی بەجارێ بێنە! هێندە هات‌وچۆ مەکە!› ▤ ١و٢. یکجا

**جارێک** / carêk/: ☜ جارێ

▣ **جارێک لە جاران**: ساڵێ بۆ ئەیام؛ جارێک، ئەویش بە هەڵکەوت ▤ یک بار اتفاقی

**جارێکـان** / carêkan/: ئاوەڵکار. ١. هێشتا؛ هێشتان ‹جارێکان نەزاوە› ٢. بۆ ماوەیەک ‹جارێکان هیچ مەڵێ› ٣. بە جارێ ‹جارێکان هەڵیگرت› ▤ ١. هنوز ٢. فعلاً ٣. یکجا

**جارێکیان** / carêkyan/: ئاوەڵکار. کەڕەتێکیان؛ یەک جار لە جاران ▤ یک بار از دفعات

**جـارِ**[1] / car̄/: ناو. ١. پەرێز؛ جێگەی دەخڵی درووێنەکراو ٢. شوێنی گیایەکی تایبەتی ٣. لەوەڕگە؛ گۆڕان؛ جێ‌لەوەڕ ٤. کاری ڕاگەیاندن بە دەنگی بەرز ٥. زەوی نەکێڵدراو ▤ ١. زمین درو شده ٢. محل رُستن گیاهی مشخص ٣. مرتع ۴. جار؛ اعلام عمومی ۵. زمین کاشت نشده

▣ **جارِ دان**: ١. جارِ کێشان؛ ڕاگەیاندن بە دەنگی بەرز ‹لە ژێر و ژووری وڵات جارِ ئەدەین/ پەلاماری سەر ئیستیعمار ئەدەین «دلزار»› ٢. کۆ کردنەوەی خەڵک بۆ کارێ ▤ ١. جار کشیدن ٢. مردم را برای کاری جمع کردن

**جارِ ڕاهێشتن**: ☜ جارِ کێشان

**جارِ کێشان**: جارِ دان؛ جارِ ڕاهێشتن؛ خەبەر گوتن بە قەو ▤ جار کشیدن

• **جارِ**[2]: پاشگر. شوێنێ کە شتی زۆری لێ ڕواوە ‹نێرگسەجارِ؛ کەماجارِ› ▤ ـ زار

**جارِچی** / car̄çî/: ناو. ڕاگەیێن؛ قاوکەر بۆ دەنگ و باسێک ▤ جارچی؛ مُنادی

**جارِز** / car̄iz/: ئاوەڵناو. جارِس؛ جارس؛ وەڕەز؛ عێدز؛ یاس؛ بێ‌مەعد؛ بێزار ▤ بیزار

▣ **جارِز بوون**: وەڕەز بوون ‹جارِز بووی لە دونیای

بێ‌فەڕ/ دونیای پڕ لە دەسبڕی و گەڕ «هەژار، بۆ *کوردستان*»› بیزار شدن

**جاڕز کردن**: وەڕەز کردن بیزار کردن

**جاڕزی** / cař(i)zî/: ناو. پەکەری؛ دوزاخە؛ فڕۆز؛ قەڵسی پکری

**جاڕس** / cařis/: ☜ جاڕز

**جاڕکێش** / cařkêş/: ناوەڵناو. قاڕقاڕۆک؛ هەڵاڵەکەر؛ کەسێ کە بۆ شت فرۆشتن هەرا دەکا جارچی

**جاڕنامە** / cařname/: ناو. بەلاڤۆک؛ داخویان؛ نووسراوەیەک بۆ ڕاگەیاندنی شتێ بە شێوەی هەواڵ اعلامیّه

▣ **جاڕنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان**: بەڵگەیێ کە وەک دەستووری ڕێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان کاری پێ دەکرێ منشور ملل متحد

**جاڕ و جڕ** / cař û ciř/: ناو. زەوینێ کە دوو ساڵ لە سەر یەک بکرێتە گەنم زمینی که دو سال پیاپی زیر کشت گندم برود

**جاڕوو** / cařû/: ناو. ١. جاروفک؛ جەریفک؛ جێریفک؛ گەسک؛ گێزگ؛ گسک؛ گزی؛ گزگ؛ گزک ٢. قسلاو و خۆڵەمێش بۆ سواغ دان ١. جارو ٢. ساروج

**جاڕووبەند** / cařûbend/: ناوەڵناو. قسڵ و خۆڵەمێش تێ‌هەڵسواو؛ شۆرباوڕێژکراو؛ بە قسل سواغ‌دراو ساروج اندود

**جاڕەبی** / cařebî/: ناو. بیجاڕ؛ بیەجاڕ؛ جاڕی داربی بیدزار

**جاڕەگسک** / cařegis(i)k/: ناو. گزگجاڕ؛ زەوینێ کە گەسکی لێ بروێ گزستان

**جاڕەوجاڕ** / cařewcař/: ناو. کار و ڕەوتی چاندنی دووجارەی گەنم لە جاڕەگەنمدا عمل کاشتن دو سال پیاپی گندم در یک زمین

**جاست** / casit/: ناو. شوێنی هەڵفلیقان و شێلانی ترێ تا ئاو بداتەوە محل آبگیری انگور

**جاسوس** / casûs/: ناو. شووفار؛ شۆفار؛ زوانگیر؛ خەوەردز؛ پاپی؛ تێ‌چێن جاسوس

**جاسوسگا** / casûsga/: ناو. جاسووسگە؛ بۆسە؛ حەشارگە؛ سیپەی سەیاد؛ ڕەوەتی ڕاوچی ‹جەو جاسووسگاوە بەو خەدەنگەوە/ دڵ تلنا وە زام هەزار ڕەنگەوە «مەولەوی»› کمینگاه

**جاسوسگە** / casûsge/: ☜ جاسوسگا

**جاسوسە** / casûse/: ناو. مەگەزە؛ قوتکەی سەر لوولەی تفەنگ مَگسک تفنگ

**جاسوسی** / casûsî/: ناو. زیرانی؛ گۆهبەلی؛ شووفاری جاسوسی

**جاش**[١] / caş/: ناو. ١. جەحش؛ جەحشک؛ هۆڵیکەر؛ کەرکوڕی؛ بەچکەی کەر ٢. *[فیقهـ، باوکەوتوو]* پیاوێ کە کرێ دەستێنێ، ژنی سێ‌تەلاقە بە وادە مارە بکا و تەلاقی بداتەوە تا دیسان لە شووەکەی مارە بکرێتەوە ٣. مەوج؛ جاجم؛ وەپێچی؛ تەنراوێک لە بەنی ڕەنگ‌کراو، جل‌وبانی تێ دەپێچن ٤. *[پلار]* بەکرێ‌گیراو؛ خۆفرۆش ‹یەکێکیان ئەڵێ فلان‌کەس باشە/ ئەوی‌تر ئەڵێ ئەحمەق و جاشە «بێکەس»› ١. کرّه‌خر ٢. مُحلل ٣. رختخواب‌پیچ ٤. خودفروش؛ عامل بیگانه

**جاش**[٢]: پێشوشە. خراو و خوارتر لە ماک ‹جاش‌کەوش؛ جاش‌پاتۆل› بدلی؛ بدل

**جاش‌باڵتە** / caşbałte/: ناو. ملتیان؛ پاڵتۆی کورتی تا سەر ئەژنۆ پالتوی کوتاه

**جاشک** / caşik/: ناو. جاش؛ جەحش؛ بەچکەکەر؛ هۆڵیکەر؛ دەحشک؛ جەحشک ‹جاشک هاتە بەر بارێ، بار نەما لە هەوارێ «مەسەل»› کُرّه‌خر

**جاشکۆڵە** / caşkołe/: ☜ جاشولکە

**جاش‌کەوش** / caşkewş/: ناو. کاڵە؛ کەوشی لە

چەرمی هەرزانبایی ☰ کفش نازل

**جاشولکه** / caşûlke/: ناو. جاشکۆڵـه؛ بەچکـەی کەری ساوا ☰ کُرّەخر کوچولو

**جاشەکەر** / caşeker/: نـاو. دەحـــش؛ کـــوڕڕی؛ جاش؛ بەچکەی کەر ☰ کُرّەخر

**جاشییەتی** / caşîyetî/: نـاو. *[پـلار]* خۆفرۆشـــی؛ بەکرێ‌گیراوی ☰ خودفروشی

**جاعێر** / ca'êr/: ☜ **جەحێڵ**

**جاف**[١] / caf/: نـاو. ١. هـۆزێکی گـەورەی کـوردە ‹خزمینە مەدەن پەنجـە دەگـەڵ عیشـرەتی جافـا/ مێرووله نەچێ باشه بـه گـژ قوللـەیی قافـا! «شـێخ ڕەزا»› ٢. گیایەکە کە لە ئاودا دەڕوێ، گوڵـێکی وەنەوشی هەیە ☰ ١. طایفەای کُردزبان ٢. گیاهی آبزی با گلهای بنفش

**جاف**[٢]: ئاوەڵناو. *[پلار]* جلـف؛ بەدئـەدا؛ نـەگونجاو؛ سووک ☰ جلف و بداطوار

**جافری** / caf(i)rî/: ناو. جەعفـەری؛ جەحفـەری؛ مەعــدەنووس؛ مــەدەنووس؛ مەیــدنۆز؛ زورک؛ گێژنۆک؛ مـەیلنۆز؛ بەقـدەنووس؛ شـانۆکەباخی؛ شانۆکی؛ گیایەکی دووساڵانی گەڵا پەڵ- پـەڵی گـوڵ پچـووکی سـەوزکارە کـە تـام و بـۆنێکی خۆشـی هەیـە، دەخـورێ و سـەوزییەکی زۆر ناسراوە ☰ جعفری

**جافی**[١] / cafî/: ناو. پانتۆڵی فش و فۆڵ تایبەت بە جافان ☰ نوعی شلوار ویژەی ایل جاف

**جافی**[٢]: ئاوەڵناو. پێوەندیـدار بـە جافـەوە ‹شـواڵ جافی› ☰ جافی

**جاقی** / caqî/: ئاوەڵناو. ١. لووس؛ بریقەدار؛ سواو ٢. *[کینایـه]* ســاوازە (منــداڵ)؛ تایبەتمەنــدی منداڵـێک کـە زۆری لـێ درابـێ و بـە لێـدان ڕاهاتبێ ‹بە لێدان چاری نایە، تازە جاقی بـووە› ☰ ١. صاف و برّاق ٢. نامُقیّد (کودک)

**جاکاندن** / cakandin/: چاوگ. جوون؛ جاوین ☰ جویدن

**جاکەت** / caket/: ناو. پولیـوێر؛ کراسـی چنـراوی بەرۆک بەستراو ☰ پُلیور

**جاکەش** / cakeş/: ناو. *[ناشیرین]* جاکێش؛ دەویت؛ قورمساخ؛ گەوواد؛ کەسێ کە ژنانی داوێن‌پـیس بۆ پیاوانی ناپاک ساز دەکا ☰ جاکش

**جاکێش** / cakêş/: ☜ **جاکەش**

**جاگرتە** / cagirte/: ئاوەڵناو. جێگرتوو؛ دانیشـتوو ☰ مقیم

**جاگـە** / cage/: نـاو. ١. جێگـە؛ شـوێن ‹بـەلام شیرینی جە لام تالییەن/ جات خالی نەبۆ جاگـەت خالییەن «مەولەوی»› ٢. جادە؛ ڕێگە ☰ ١. مکان ٢. جاده

**جال** / cal/: ئامراز. بارتـەقای؛ لـە بەرانبـەردا؛ لـە تۆڵەدا ☰ در ازایِ؛ در عوضِ

**جـالۆ** / calo/: ناو. جالە؛ پرد؛ زۆرتر پردی داریـن ☰ پُل چوبی

**جالە** / cale/: ☜ **جالۆ**

**جاڵ** / cał/: ناو. ١. ☜ **جـەحێـڵ** ٢. داو؛ داو لـە هـەودای مـوو، بـۆ مـەل ڕاو کـردن ☰ ١. ☜ **جەحێڵ** ٢. نوعی دام

**جاڵجالوکه** / całcalûke/: ☜ **جاڵجاڵۆکه**

**جاڵجاڵۆکه** / całcałoke/: ناو. جاتەنە؛ جاجۆلکە؛ جاوتەنــــە؛ جالجالــــووکە؛ جالــــجالووکە؛ جومێ‌تەنکە؛ جۆلاتەنە؛ جۆلایی‌کەرە؛ جیلابـاف؛ داوتەنە؛ کاکلەمووشان؛ پیرۆشک؛ ناوی گشـتی بـۆ هـەرکام لـە مێـروانی جالجالـۆکەیی بـە سەرسنگ و سکی بێ‌گرێ، پـای شـاویلکەیی و شەش جومگەوە، برێ بـە چـوار جـووت چـاو و برێ بێ‌چاو، بـرێکیان لـە نـاو خۆڵـدا دەژیـن و بـرێکیان لـە ئـاودا و زۆرتـر نێرەکانیـان لـە مێیینەکان بچووکترن ☰ تارتنک؛ عنکبوت

**جاڵجاڵوکه** / całcałûke/: ☜ **جاڵجاڵۆکه**

**جاڵە** / cale/: ناو. جارە؛ تاوێر؛ ئوتـووز 🇮🇷 سنگ غلتان کوه

▣ **جاڵە کردن**: تلانـدن؛ تلاندنـەوە؛ تلاننـەوە 🇮🇷 غلتاندن

**جام** / cam/: ناو. ١. قاپ؛ زەرک؛ تـاس؛ دەفـری قوولی چکۆلە لە کانزا ‹... چوار جام ڕووحی یەی دانە سینی/ چە بکەم وە دەس کرانشینی؟ «شـامی کرماشـانی»› ٢. جـامی مـەی؛ پیاڵـەی پـڕ لـە شـەراب ‹دەمێـک سـاقی دەمـت بێنـە! دەخیلـی چاوەکانت بم/ بە جامێک دەستی من بگرە! فیـدای پیری موغانت بم «وەفایی»› ٣. شیشـە؛ شووشـە ٤. ئاوێنە ‹پاییز زەڕ یەخ جام چارشێوێ هەی تەم/ دێرەن سوارەن نەوعەرووس خەم «مەولـەوی»› ٥. کاپ؛ دەفرێکی نەخش و نیگاردار بـە پێچکـە و دەسـکەوە کـە بـە سـەرکەوتوانی کێبەرکێیـە وەرزشییەکان خەڵات دەکرێت 🇮🇷 ١. جام ٢. جام می ٣. شیشه ۴. آینه ۵. کاپ

▣ **جامی جیهانی**: جـامی جیهـانی فیفـا؛ جـامی جیهانی تۆپیپێ؛ کێبەرکێی جیهانی فووتباڵ کـە چوارسـاڵان جـارێ لـە وڵاتێـک بـەڕێوە دەچێ 🇮🇷 جام جهانی

▣ **جام زڕیان**: *[کینایە]* ناو زڕیـان؛ ئابـڕوو چـوون؛ ڕسوا بوون 🇮🇷 تشت از بام اُفتادن؛ رسوا شدن

**جامـاڵ** / camał/: نـاو. خانـەدان؛ ماڵـەگەورە 🇮🇷 خاندان

**جاماڵگە** / camałge/: نـاو. هەواری چۆڵ؛ زۆزانێ کۆچەری لێ نەمایێ 🇮🇷 ییلاق ترک شده

**جامانـە** / camane/: نـاو. جامەدانـە؛ جامـەدانی؛ ئاغابانوو؛ پارچەیێک پیاوان دەیکەنە سەروێن 🇮🇷 نوعی دستار مردانه

**جامبـاز[1]** / cambaz/: نـاو. جانبـاز؛ دەڵاڵـی وڵاغ فرۆشتن 🇮🇷 دلال ستور

**جامباز[2]**: ئاوەڵناو. *[پلار]* جانباز؛ فێڵباز و دەسبڕ 🇮🇷 کُلاهبردار

**جامبـازە** / cambaze/: نـاو. جانبـازە؛ دۆخـی دەست بڵند کـردن و هەڵـبەزینی ئەسـپ یـان وشتر 🇮🇷 چراغپا

**جامبازی** / cambazî/: ناو. جانبازی: ١. دەڵاڵـیی وڵاغ فرۆشـتن ٢. *[پلار]* دەسـبڕی و فێڵـبازی ‹مایە هومێـدی کیـژی چاوهەڵـۆ/ نـازانی مـەکر و جامبـازی و درۆ «هـێمن»› 🇮🇷 ١. دلالی ستور ٢. کُلاهبرداری

**جامتا** / camta/: ☜ **جانتا**

**جامچی** / camçî/: ناو. شیشەبڕ 🇮🇷 شیشەبر

**جامخانـە** / camxane/: نـاو. ویتـرین؛ شـوێنی ڕانانی شتی فرۆشتن ‹کۆگاکانی دەوری قەڵا/ نـاو جامخانـە، سـەر ڕەفـەکان/ ... هـەمووی گـەڕام «شێرکۆ»› 🇮🇷 ویترین

**جاملـووس** / camlûs/: ئاوەڵـناو. جامـەلووس؛ زوانلـووس؛ زمـانلـووس؛ ماسـتاوکەر؛ پیازپاککەر؛ کلکەسووتەکەر 🇮🇷 چاپلوس

**جامۆلکە** / camolke/: ☜ **جامولکە**

**جامۆڵە** / camołe/: ☜ **جامولکە**

**جامولکـە** / camûlke/: نـاو. جامۆلکـە؛ جامۆڵـە؛ تاسوولکە؛ زەرکی بچووک 🇮🇷 طاسک

**جامەدانـە** / camedane/: نـاو. ١. ☜ **جامانـە** ٢. منالدان؛ پزدان 🇮🇷 ١. ☜ **جامانە** ٢. زهدان

**جامەدانی** / camedanî/: ☜ **جامانە**

**جامەڕبە** / cameř(i)be/: ناو. پێوانەیێ بەرانبەر بـە شەش مشت دەغڵ 🇮🇷 کیل چهار کیلویی غلات

**جامەک** / camek/: ناو. ئاوێنە 🇮🇷 آینه

**جامەلوس** / camelûs/: ☜ **جاملوس**

**جامەلوسکێ** / camelûskê/: نـاو. زمـانلووسـی؛ دەمتەڕی؛ کلکەسووتێ 🇮🇷 چاپلوسی

**جامەمەرگ** / camemerg/: ناو. کفن؛ بەرگی مردوو 🇮🇷 کَفَن

**جامەمەڕی / camemeřî/**: ناو. مەڕدۆش؛ جامی مەڕ دۆشین 🇮🇷 سطل ویژەی دوشیدن دام

**جامەنە[1] / camene/**: ناو. میرات؛ کەلەپوور 🇮🇷 میراث

**جامەنە[2]**: ناوەڵناو. بەجێماو؛ جێماو؛ دواکەوتە 🇮🇷 جامانده

**جامیلکە / camîlke/**: ناو. ١. جامی چووک ٢. دەفری چووک 🇮🇷 ١. آینەی کوچک ٢. ظرف کوچک

**جامێر / camêr/**: ☜ **جوامێر**

**جامێری / camêrî/**: ☜ **جوامێری**

**جان[1] / can/**: ناو. ١. گیان؛ ڕۆح ‹ئەوەندە من لە هیجری وەسڵی تۆ زاری ئەکەم جانا/ وەکوو داوێنی ئەڵوەن دائیمەن من سوورە دامانم «ئەحمەد موختار بەگی جاف»› ٢. کان؛ مەعدەن ٣. باخچە 🇮🇷 ١. جان ٢. معدن ٣. باغچە

**جان[2]**: ناوەڵناو. جوان؛ لەبەردڵان 🇮🇷 زیبا

**جانانە[1] / canane/**: ناو. گراوی؛ ماشووقە؛ یاری مێوینە ‹پەروازی جانە، ڕۆیینی جانانە، وەرنە بۆچ/ تۆ گۆڕەوی لە پێ دەکەی و من لە دەست نەچم؟! «مەحوی»› 🇮🇷 معشوقە

**جانانە[2]**: ناوەڵناو. سەڵیتە؛ زماندرێژ و سازنە 🇮🇷 سلیطە

**جانباز / canbaz/**: ناو. ١. ☜ **جامباز** ٢. گیان بەختکەر 🇮🇷 ١. ☜ **جامباز** ٢. جانباز

**جانبازە / canbaze/**: ☜ **جامبازە**

**جانبازی / canbazî/**: ناو. ١. ☜ **جامبازی** ٢. کار و کردەوەی گیان بەخت کردن ‹نیمنیگات ڕەفیق تیرئەندازی بۆ/ دڵەی من نیشان نە جانبازی بۆ «مەولەوی»› 🇮🇷 ١. ☜ **جامبازی** ٢. جانبازی

**جانتا / canta/**: ناو. جامتا: ١. خورجێنی چکۆلەی سەرشان ٢. چەمەدان؛ باولی 🇮🇷 ١. کولەپشتی ٢. چمدان

**جاندار / candar/**: ناو. لەشکرچی ترکان 🇮🇷 سرباز ترک عثمانی

**جاندارم / candarm/**: ناو. جەندرمە؛ جندرمە؛ قۆڵچی؛ پولیسی ڕێگاوبان و دەوروبەری شار 🇮🇷 ژاندارم

**جاندبەر / candiber/**: ناوەڵناو. جانەوەر؛ زیندوو 🇮🇷 جاندار؛ ذیروح

**جانفاس / canfas/**: ناو. ١. جۆرێک حەریر ٢. چندراو لە گوش 🇮🇷 ١. بافتەی ابریشمی ٢. بافتەی کنفی

**جانک / can(i)k/**: ناو. ١. کیژی پێگەیشتوو ٢. ☜ **جوانوو** 🇮🇷 ١. دختر جوان ٢. ☜ **جوانوو**

**جانکان / cankan/**: ناو. گۆڕ؛ قەور 🇮🇷 قبر

**جانکوش / cankuş/**: ناو. مجێوری کلیسا؛ خزمەتکاری کلیسا 🇮🇷 شماس

**جانکووش / cankûş/**: ☜ **جانقووش**

**جانگ / cang/**: ناو. ١. شنک؛ جنیک؛ قلقلک؛ پێشەسەر؛ هەرکام لە دوو ئێسکی تەپڵی سەر ٢. کەنارەی دەم و چاو ٣. کرواس؛ جاو؛ تەنراوی جۆلا لە دەزووە لۆکە ‹سۆفی و سەر و مێزەر، من و زوڵف و سەر و دەسماڵ/ من کوشتەیی لاجانگم و ئەو کوشتەیی جانگە «نالی»› 🇮🇷 ١. آهیانە ٢. عارض؛ عُذار ٣. کرباس

**جانگۆر / cangor/**: ناو. گیانفیدا؛ گیانباز. هەروەها: **جانگۆری** 🇮🇷 فدایی

**جانگی / cangî/**: ناو. جانگ؛ لاجانگ 🇮🇷 آهیانە

**جانماز / can(i)maz/**: ناو. بەرماڵ؛ دوگرد؛ جارماز 🇮🇷 جانماز؛ سجادە

**جانوو / canû/**: ☜ **جوانوو**

▣ **جانوو ئەسپ**: ☜ **جوانوو ئەسپ**

**جانوو مایین**: ☜ **جوانوو مایین**

**جانەدان / canedan/**: ناوەڵناو. ڕەسەن؛ بە نژادی چاک 🇮🇷 اصیل؛ نجیب

**جانەر / caner**/: ناو. گوڵێکی سپی ئاماڵ بۆری بۆنخۆشە 🇮🇷 گُلی خوشبوی سفید مایل به خاکستری

**جانەگا / canega**/: ☜ **جوانەگا**

**جانەمەرگ / canemerg**/: ناو. جانەمێرگ؛ گولەنەورۆزە؛ گیایەکە لە بنەماڵەی زەمەق و گەزیزە، گەڵاکانی باریک و چکۆلەترە لە گەزیزە، گولەکانی بەنەوشی کاڵە و پێش هەموو گوڵێ لە سەرەتای نەورۆز دەردێت 🇮🇷 نوعی زنبق

**جانەوەر / canewer**/: ناو. ١. گیانەوەر؛ گیاندار؛ زیندەوەر؛ جناوەر؛ خاوەن گیان ‹لەو هەموو جانەوەرەی وەردەکەوێ/ نازنینیش هەیە لای‌لایی دەوێ «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ٢. حەیوانی درندە و ترس وەپێشخەر ‹ڕەفیقی جانەوەرانم، ئەسیری بەندی ئەوین/ هەمیشە ڕووتەڵی نێو باغ و دەشت و کۆسارم «ئاوات»› ٣. کرمی ناو سک ‹شەربەتی جانەوەر› ٤. مێروو؛ جڕوجانەوەر، بەتایبەت ئازاردەر (وەک سپێ، گەنە، سوورکە و دووپشک) ‹هەمو گیانی بۆتە لیر، دەبێ جانەوەری پێدا گەڕابێ› ٥. *[مەجاز]* مرۆی نالەبار و قۆشمە 🇮🇷 ١. جانور ٢. هیولا ٣. کرم روده ۴. حشرەی موذی ۵. آدم موذی

**جانی / canî**/: ☜ **جوانو**

**جانیک / canîk**/: ☜ **جوانو**

**جانێ / canê**/: ناو. بەستەیەکی ناوداری کوردییە لە گۆڤەند و شاییدا دەیڵێن 🇮🇷 از ترانەهای کُردی

**جاو[1] / caw**/: ناو. جانگ؛ شاڵی لە داوەڵۆکە ‹چوونکە بازاڕی غەزەل ما بێ ڕەواج/ ئێستە من مەشغووڵی جاوم ناعیلاج «ناری»› 🇮🇷 کرباس

⊡ **جاو نانەوە** ١. ڕایەڵ کردنی چرێشاوی بووزوو ٢. *[کینایە]* هات‌وچوو کردنی زۆر و بەلەز 🇮🇷 ١. ردیف کردن تارهای شال ٢. رفت و آمد شتابان

▪ **جاو[2]**: پاشەوشە. ١. جاوێن؛ جاکێن ‹بنێشت‌جاو؛ جاچکەجاو› ٢. شکاو؛ ڕزیو ‹ئاسن‌جاو› 🇮🇷 ١. ـ خا ٢. ـ پارە

**جاوپێچەک / cawpêçek**/: ناو. دارێ کە جۆلا جاوی تێدەپێچێ 🇮🇷 چوبی که کرباس بر آن پیچند

**جاوتەنە / cawtene**/: ☜ **جاڵجاڵۆکە**

**جاوران / cawran**/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //جاورای؛ دەجاورێی؛ بجاورێ// ١. جاویان ٢. شکان؛ شکیان 🇮🇷 ١. جویده شدن ٢. شکسته شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: جاوراو/ چاوگی نەرێنی: نەجاوران

**جاوراو / cawraw**/: ☜ **جوراو**

**جاوراوە / cawrawe**/: ئاوەڵناو. قەڵش‌بردە 🇮🇷 ترک‌خوردە

**جاورس / cawris**/: ☜ **گارس**

**جاوگ / cawig**/: ناو. کرواس؛ جاو؛ جانگ 🇮🇷 کرباس

**جاو و جۆڵ / caw û coł**/: ناو. دۆخی لە شوێنێک دانەسەکان و تاونەتاو جێگۆڕین 🇮🇷 حالت در جایی آرام نگرفتن

**جاوەجا[1] / caweca**/: ناو. جێگەبەجێگە؛ کار و ڕەوتی گوێزانەوە؛ گوێزیانەوە 🇮🇷 جابجا

**جاوەجا[2]**: ئاوەڵکار. هەر ئێستە؛ جێبەجێ 🇮🇷 فوراً

**جاوەجاو[1] / cawecaw**/: ☜ **ژاوەژاو**

**جاوەجاو[2]**: ئاوەڵکار. منجەمنج؛ منگەمنگ؛ **گوڤڤی**؛ قسەی بە پرتە و سرتەوە 🇮🇷 مِن‌ومِن

**جاوەرجا / cawerca**/: ئاوەڵکار. جاوەجا؛ جێبەجێ؛ دەسبەجێ؛ هەر ئێستە 🇮🇷 بی‌درنگ؛ فوراً

**جاوی / cawî**/: ☜ **جەوی**

**جاویاگ / cawyag**/: ☜ **جوراو**

**جاویان / cawyan**/: ☜ **جاوران ـ١**

**جاویاو / cawyaw**/: ☜ **جوراو**

**جاوین / cawîn**/: چاوگ. تێپەڕ. //جاویت؛ دەجاوی؛ بجاوە// جوین؛ جووتن؛ جوون؛ جاکاندن 🇮🇷 جویدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: جاویاگ/ چاوگی نەرێنی:

نەجاوین

**جاوینەوە** / cawînewe/: چاوگ. تێپەڕ. //جاویتەوە؛ دەجاویەوە؛ بجاوەوە// ١. دووبارە جاوین؛ دیسانەوە جوون ٢. ددان بە سەر شتێ ڕەقدا هێنان ☰ ١. دوباره جویدن ٢. دندان بر جسم سخت نهادن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەجاوینەوە

⊡ **قسە جاوینەوە**: ١. چەندپاتە کردنەوەی قسە ٢. خراپ دەربڕینی وشە لە قسەکردندا، وا کە لێی دژوار تێ بگەی ☰ ١. چندباره گفتن ٢. نافصیح صحبت کردن

**جاهاڵ** / cahał/: ☜ **جەحێڵ**

**جاهیل** / cahîl/: ئاوەڵناو. نەزان؛ تێنەگەیشتوو؛ دوورەزانست ☰ جاهل؛ نادان

**جاهێڵ** / cahêł/: ☜ **جەحێڵ**

**جایاندن** / cayandin/: ☜ **جوولاندن**

**جاینک** / cayink/: ناو. لاجانگ؛ هەر دوو لای سەر ☰ گیجگاه

**جببە** / cibbe/: ناو. ١. جبە؛ جۆرە کەوایەکی پێش ئاوالەی مەلایانەیە ٢. جەریمە؛ تاوان ☰ ١. جُبّه ٢. جریمه

⊡ **جببە کردن**: جەریمە کردن ☰ جریمه کردن

**جبرائیل** / cibra'îl/: ناو. سرووش؛ فرشتەی پەیامبەر ☰ جُبرئیل

**جبلە** / cible/: ناو. کەڵەباب؛ کەڵەشێر ☰ خروس

**جبۆ** / c(i)bo/: جێناو. فلانی؛ کاورا ☰ فلانی؛ یارو

**جبە**[1] / c(i)be/: ناو. ١. ☜ **جببە ـ١** ٢. ئەسپابی شەڕ ☰ ١. ☜ **جببە ـ١** ٢. جنگ‌افزار

**جبە**[2]: ئاوەڵناو. ١. سەربەست ٢. بەخشراو ☰ ١. مُجاز ٢. عفو شده

**جبەخانە** / c(i)bexane/: ناو. جبەڵخانە؛ جەبەڵخانە؛ جەبیلخانە؛ کارگەی بەرهەم هێنانی چەک و تەقەمەنی شەڕ ☰ زرادخانه

**جبەڵخانە** / c(i)bełxane/: ☜ **جبەخانە**

**ججار** / c(i)car/: ئاوەڵکار. قەت؛ قە؛ هەرگیز؛ هیچ‌گا ☰ هرگز

**ججاڵ** / cicał/: ناو. جرجاڵ؛ جڕجاڵ؛ جاڵ؛ جەجاڵ: ١. *[باوەڕی کۆن]* کەرسوارێکی خەیاڵییە، گوایە ڕۆژێک دەردەکەوێ و خەڵک بانگ دەکاتە سەر ئایینی خۆی و فریویان دەدا ٢. *[مەجاز]* ساختەچی؛ درۆزن و گزیکار ☰ ١. دجّال ٢. فریبکار

**ججە** / cicce/: دەنگ. وشەی دەنگ دانی مەڕ بۆ دەرکەوتن لە هۆڵ ☰ حرف راندن گله از آغل

**ججو** / cicû/: ناو. *[منداڵانە]* جوجوو؛ جووجەڵە؛ جووچکەمەل ☰ جوجه

**جحێڵ** / c(i)ĥêł/: ☜ **جەحێڵ**

**جحێڵایەتی** / c(i)ĥêłayetî/: ناو. قیتەقیت؛ هات‌وچۆ بۆ هەستی لاوی و حەزی جینسی ☰ ورجەوورجەی عاشقانه

**جحێڵی** / c(i)ĥêłî/: ناو. ئازەوی؛ لاوی ☰ جوانی

**جخار** / c(i)xar/: ناو. خەم؛ کەسەر؛ کوڵ ☰ غم؛ اندوه

**جخارە** / c(i)xare/: ☜ **جگەرە**

**جخز** / cixz/: ☜ **جەغز**

**جدا** / c(i)da/: ئاوەڵناو. جیاواز؛ جودا؛ جیا ☰ جُدا؛ سوا

**جدەو**[1] / cidew/: ناو. جەدەو؛ ولاخە بەرزەی پشت بریندار ☰ بارکش پُشت‌ریش

**جدەو**[2]: ئاوەڵناو. جەدەو؛ لەکارکەوتوو «کە شەو دایماڵی پەنجەی یاری جوانی/ بە ڕۆژ با هەر جدەو بێ پیل و شانی «هێمن»» ☰ از کار افتاده

**جرپن** / cirpin/: ئاوەڵناو. جرپۆ: ١. هەدانەدەر؛ دانەسەکناو؛ ئۆقرەنەگرتوو ٢. *[ئاشیرین]* ترکەن؛ ترن ☰ ١. وروجَک ٢. گوزو

**جرپوجۆپ** / cirp û cop/: ☜ **جرت‌وفرت**

**جرپۆ** / cirpo/: ☜ **جرپن**

**جرت**[1] / cirt/: ناو. [ناشیرین] جـرت؛ زرت؛ شـیر ☰ شیشکی

**جرت**[2]: ئاوەڵناو. [ناشیرین] جلـف؛ سـووک ☰ جلـف؛ هرزه

**جرتاندن** / cirtandin/: چاوگ. تێنەپەڕ. //جرتانـدت؛ دەجرتێنی؛ بجرتێنه//[ناشیرین] جرت لێـدان؛ زرت کێشان ☰ شیشکی بستن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەجرتاندن

**جرتوپرت** / cirt û pirt/: ☜ **جرتوفرت**

**جرتوفـرت** / cirt û firt/: نـاو. جـــرتوپـــرت؛ جرپوجۆپ؛ هەڵبەز ـ دابـەزی بێخـۆ ‹قـەیوان و قوتره و کونەماسی لـە دەسـت نـەدەین/ دوایـی بـە جرتوفرتەوە هانا بۆ کێ ئەبـەین؟ «پیرەمێـرد»› ☰ ورجه ـ وورجه

**جرتـه** / cirte/: ناو. ١. کەپەنک؛ باڵـتەی لـباد ٢. نیوه نووزه ☰ ١. فرجی ٢. نالەی خفیف

◘ **جرتـه هـاتن**: نووزەنـووز کـردن ‹هـەر لەبـەر خۆیەوە جرتەی دێ› ☰ نالیدن

**جرتەجرت** / cirtecirt/: ناو. ١. [ناشیرین] دەنگی بـا لێ بەر بوونی لە سەر یەک ٢. [کینایە] خوتەوبۆڵە ☰ ١. جِر و جِر ٢. غرولند

**جرتیفرتـــی** / cirtîfirtî/: ئاوەڵـــــناو. [پـــــلار] دانەسەکناوی سووک ☰ بازیگوش هرزه

**جرتێ** / cirtê/: ئاوەڵناو. [پلار] سووک و چـرووک و بێئارام و قەرار (بۆ ژن دەگوترێ) ☰ جلف و نـاآرام (زن)

**جـرج** / circ/: نـاو. جـــرد؛ مشــکەکوێره؛ مشــکی دەشتی ☰ موش کور

**جرجاڵ** / circał/: ☜ **ججاڵ**

**جرجەکوێره** / circek(i)wêre/: ☜ **جرجەمشك**

**جرجەمشـک** / circemişk/: نـاو. جرجـــەکوێره؛ مشکەکوێره؛ کۆرەمشک؛ ستیڤلۆک ☰ موش کور

**جرد** / cird/: ☜ **جرج**

**جرکه** / cirke/: ☜ **چرکه**

**جرم** / cir(i)m/: ناو. ١. بەڵغ و خەڵـتەی تـزاو ٢. ☜ **جم**[1] ☰ ١. جِرم ٢. ☜ **جم**[1]

**جرمگـر** / cir(i)mgir/: نـاو. بەڵــغگر: ١. مـاکێکی کیمیاوی کە خڵت و بەڵخ لە خۆیدا دەتاوێنێتەوه ٢. کلافەئاسایەکی کانزایی جرم دەگرێتـە خـۆی ☰ ١و٢. جِرمگیر

**جرموجوڵ** / cirm û cûl/: ☜ **چرکه**

**جرنگ** / ciring/: دەنگـەناو. دەنگی بە سـەر یەکـدا کەوتنی کانزا، بەتایبەت زێو ☰ جیرینگ؛ صدای بر هم افتادن فلز

**جرنگانـــدن** / c(i)ringandin/: چـــاوگ. تێنەپـــەڕ. //جرنگاندت؛ دەجـرنگێنی؛ بجرنگێنـه// جرنگنـای؛ جرنگیای؛ جرینگ و جانگ پێکـردن ☰ بـر هـم افکندن فلز و سر و صدا کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەجرنگاندن

**جرنگنای** / c(i)ringnay/: ☜ **جرنگاندن**

**جرنگوهۆڕ** / c(i)ring û hoř/: دەنگـەناو. دەنگـی زۆری وێککەوتنی کانزا ☰ درنگ درنـگ؛ صـدای ممتد بر هم افتادن فلزات

**جرنگـه** / c(i)ringe/: دەنگـەناو. چرنـــگ؛ زرنگـــه؛ دەنگی وێککەوتنی سکه، بەتایبەت زێڕ و زێو ☰ جرینگ؛ صدای به هم خوردن مسکوکات

**جرنگەجرنگ** / c(i)rngec(i)ring/: دەنگەناو. دەنگی زۆری بـــە ســـەر یەکـــدا کـــەوتنی کـــانزا ☰ جیرینگ‌ـجرینگ

**جرنگیای** / c(i)ringyay/: ☜ **جرنگاندن**

**جرووسکه** / c(i)rûske/: ناو. چرووسـکه؛ تررووسـکه ☰ درخشش

**جرووکه** / c(i)rûke/: دەنگـەناو. دەنگـی خوێنـدنی زیلی برێ جانەوەر ☰ صدای زیر جانداران کوچک

**جریت** / c(i)rît/: ناو. جرید؛ جلیـت: ١. سووکەڵـە دارێک کـە سـواران لـە مەیدانـدا بـە یەکتریـدا

دەدەن ٢. فیچقە؛ فیشقە ☰ ١. چوب کوچک بازی سوارکاران ٢. فوران

**جریتان** / c(i)rîtan/: ناو. جلیتبازی؛ جریتبازی؛ جریدبازی؛ گەمەی جلیت ☰ چوببازی سوارکاران

**جریتباز** / c(i)rîbaz/: ناو. جلیتباز؛ کەسێ کە کایەی جریتبازی دەکا ☰ سوارکار بازی با چوب

**جرید** / c(i)rîd/: ☜ جریت

**جریدانێ** / c(i)rîdanê/: ناو. تەڕاتێن؛ قۆشمانێ ☰ جَوَلان اسب در میدان

**جریدبازی** / c(i)rîdbazî/: ☜ جریتان

**جریفک** / c(i)rîfk/: ناو. گەسک؛ گزگ ☰ جارو

**جریک** / c(i)rîk/: ☜ جریکە

**جریکان** / c(i)rîkan/: ☜ جریکاندن

**جریکاندن** / c(i)rîkandin/: چاوگ. جریکان؛ جریکەجریک کردن ☰ جیک ـ جیک کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەجریکاندن

**جریکنای** / c(i)rîknay/: چاوگ. جریکاندن ☰ جیک ـ جیک کردن

**جریک و جاک** / c(i)rîk û cak/: ناو. جیکەجیک ☰ جیک ـ جیک

**جریکە** / c(i)rîke/: دەنگەناو. جریک؛ دەنگی چۆلەکە ☰ صدای گنجشک

**جریکەجریک** / c(i)rîkec(i)rîk/: دەنگەناو. دەنگی چۆلەکان بە زۆری ☰ صدای انبوه گنجشکان

**جرینگاندن** / c(i)rîngandin/: چاوگ. بۆلاندن ☰ غر ـ غر کردن

**جرینگە** / c(i)rînge/: دەنگەناو. دەنگی بە سەر یەکدا کەوتنی زێڕ و زیو ☰ جیرینگ

**جرینگەجرینگ** / c(i)rîngec(i)rîng/: دەنگەناو. جرینگ و هۆڕ؛ دەنگی لە یەک کەوتنی خشڵ و کانزا ☰ جرینگ ـ جرینگ

**جریواندن** / c(i)rîwandin/: چاوگ. ١. جریکەجریک کردن ٢. جریوەجریو کردن

‹پێچکەی پشتەسەر لە سەر زوڵفی ڕەش/ با بجریوێنێ وەک ئەستێرەی گەش «گۆران»› ☰ ١. سوسو زدن ستارگان ٢. سروصدا کردن

**جریونای** / c(i)rîwnay/: چاوگ. جریوە کردن ☰ سوسو زدن

**جریوە**[1] / c(i)rîwe/: ناو. جریوەجریو؛ تروکەتروکی ئەستێرە ☰ سوسوی ستارە

**جریوە**[2]: دەنگەناو. جریوەجریو؛ دەنگی چۆلەکان ‹لە گوڵزاری ورینگەی بلبلی سەرمەست و شەیدا دێ/ بەڵام نایە جریوەیکیش لە هێلانەی بەتاڵی من «هێمن»› ☰ صدای گنجشکان

**جریوەجریو** / c(i)rîwec(i)rîw/: ☜ جریوە

**جڕ** / ciř/: ناو. ١. دژواری؛ سەختی؛ سەخڵەتی ٢. لەتی؛ دڕاوی؛ دڕیاگی ٣. *[ناشیرین]* جرت؛ شێڕ؛ زڕت؛ ٤. مێروو؛ گیانەوەری وردیلەی بێخوێن ☰ ١. دشواری ٢. پارگی ٣. شیشکی ۴. حشره

⊡ **جڕ دان**: دڕاندن؛ دادڕاندن ☰ پارە کردن

**جڕ داهێشتن**: *[ناشیرین]* جڕ داهێلان؛ زڕت کێشان؛ شێڕ/ شیڕ داهێشتن ☰ شیشکی بستن

**جڕ داهێلان**: ☜ جڕ داهێشتن

**جڕ دەرهاتن**: ☜ جڕ هاتن

**جڕ هاتن**: *[پلار]* جڕ دەرهاتن؛ تووشی تەنگانە بوون؛ ناڕەحەت بوون ☰ بە تنگ آمدن

**جڕاجڕ** / c(i)řaciř/: ناو. شەڕەچەقە؛ شەڕەدندووکە؛ کێشە و هەرا بە قسە ☰ نزاع لفظی

**جڕان**[1] / c(i)řan/: چاوگ. بەند هاتنی میز ☰ بند آمدن ادرار

**جڕان**[2]: ناو. ئاونگی بەردین ☰ هاون سنگی

**جڕای** / c(i)řay/: چاوگ. لووزەو بەستنی تەوش ☰ فوران کردن

**جڕبردوو** / ciřbirdû/: ئاوەڵناو. هەڵدڕاو؛ دڕاو ☰ جِرخوردە

**جڕت** / cirt/: ☜ **جرت**[1]

**جڕتنای** / cirtnay/: چاوگ.*[مەجاز]* خۆ پیس کردنی زارۆ ☰ ریدن بچه

**جڕجاڵ** / circał/: ☜ **ججاڵ**

**جڕجڕ** / circir/: ناو. بەرزەجڕە؛ بەرزەچڕە؛ سیسرکی دەشت ☰ جراسک

**جڕجڕە** / circ(i)re/: ناو. چۆلەکەئاسایەکی جوانی دووڕەنگە ☰ چرخ‌ریسک

**جڕجۆنگانێ** / circonganê/: ئاوەڵناو. بەدفەڕ و نەگونجاو ☰ بدجنس

**جڕدۆ** / cirdo/: ☜ **چڕدۆ**

**جڕنا** / cirna/: ناو. قسەی بێتام و خوێ ☰ چرند

**جڕنای** / cirnay/: چاوگ. چۆڕاندن ☰ چکاندن

**جڕوجانەوەر**/ cir û canewer/: ناو. ۱. زیندەواران؛ گیانەوەران ۲. مێرووی ئازادەر ۳. *[پلار]* شتی هیچ و پووچ ☰ ۱. جک و جانور ۲. حشرات موذی ۳. اشیاء بی‌ارزش

**جڕوجیاز**/ cir û c(i)yaz/: ناو.*[پلار]* کەلپەلی ماڵ ☰ جل و پلاس

**جڕە** / c(i)re/: ناو. چورە؛ سوریلی؛ مەلێکی بچووکی سترانبێژە بە ڕەنگی بۆری ئاماڵ‌زەرد ☰ چکاوک

**جڕەبەگزادە** / c(i)rebegzade/: ناو. مەلێکی ڕەنگاوڕەنگی جوانە ☰ پرنده‌ای رنگارنگ

**جڕەجڕ** / c(i)recir/: ناو. ۱. زەحمەت و دەرد ‹بە جڕەجڕ ڕامکێشا› ۲. کێشە؛ شەڕەقسە ☰ ۱. رنج و زحمت ۲. جَدَل

**جڕەکەو** / c(i)rekew/: ناو. زڕەکەو ☰ کبک چیل

**جڕەو** / c(i)rew/: ئاوەڵناو. تووڕە؛ قەڵس ☰ عصبانی

**جز** / ciz/: دەنگەناو. دەنگی ڕۆنی داخ یان ئاسنی سوورەوەبوو کە ئاوی وێکەوێ ☰ صدای روغن داغ یا آهن تفته در تماس با آب

**جزار** / c(i)zar/: ناو. ۱. ڕەنج؛ جەزرەبە ۲. بێگار؛ کاری بەزۆر و بێ‌مز ☰ ۱. عذاب ۲. بیگاری

**جزاڵ ـ جزاڵ** / c(i)zal c(i)zal/: ئاوەڵناو. ڕێزاڵ ـ ڕێزاڵ؛ کوتە ـ کوتە ☰ تکه ـ تکه

**جزدان** / cizdan/: ناو. کیسەباخەڵ؛ کیسەی چەرمین بۆ پووڵ تێ نان ☰ کیف بغلی

**جزقە** / cizqe/: ناو. زەنگەتە؛ تلیسک؛ تیسک ☰ تلسک

**جزم** / cizm/: ناو. ۱. جزو؛ جزوو؛ پاژێ لە سی پاژی قورئان ‹جزمی سیهەمی قورئان› ۲. جۆر؛ چەشن؛ نەوع ☰ ۱. جزء؛ بخشی از قرآن ۲. نوع

**جزمە** / cizme/: ناو. چەکمە؛ کەوشی لاسک درێژی تا ژێر ئەژنۆ ☰ چکمه

**جزو** / c(i)zw/: ناو. ۱. جزوو؛ جزم؛ پاژێ لە سی پاژی قورئان ۲. پاژ لە کێتب ☰ ۱. جزء قرآنی ۲. جزء کتاب

**جزوبز** / ciz û biz/: دەنگەناو. جز؛ چزوبز؛ کزوبز ☰ جزولز

**جزوبەند** / cizwbend/: ناو. کەسێ کە کاری جزوبەندی کتێبە ☰ صحاف

**جزوبەندی** / cizwbendî/: ناو. ۱. کاری دەستە کردن، برین، چەسپاندن، دوورین و بەرگ‌گرتنی پەڕەی کاغەز بۆ دروست کردنی دەفتەر و کتێب ‹جزوبەندیی کتێبی عومر و شیرازەی سەحیفەی دل/ بە ڕیشتەی ئولفەتی جانانە ئازادی، دەزوو بێنە! «حەریق»› ۲. کارگەی ئەو کارە ☰ ۱. صحافی ۲. کارگاه صحافی

**جزوە** / cizwe/: ناو. دەللە؛ قاوەجۆش؛ دەفری قاوە لێنان ☰ قهوه‌جوش

**جزوو** / cizû/: ناو. بەش؛ پاژ؛ پارە ‹جزووی قورئان› ☰ جُزء

**جزە**[1] / c(i)ze/: ناو. ۱. *[منداڵانە]* گۆشتی برژاو ۲. بنەگیایەکە بە کوڵاوی دەخورێ ☰ ۱. گوشت

بریان ۲. ریشەی خوراکی

**جزە**[۲]: دەنگەناو. دەنگی ڕۆنی داغ ☰ صدای روغن تفته

**جزیا** / cizya/: ناو. جەزیا؛ ئازار؛ عەزاو ‹هەڕەشە لەو خەڵکە بکە، لەو ڕۆژە کە جزیا دەدرێن «هەژار، *قورئان*»› ☰ عذاب

**جزیادراو** / cizyad(i)raw/: ئاوەڵناو. تەمێ‌خۆر؛ جزیادیتوو ☰ کیفردیده

**جزیادیتو** / cizyadîtû/: ☜ **جزیادراو**

**جزیرە** / c(i)zîre/: ناو. گراڤ؛ دوڕگە ☰ جزیره

**جزیرەئاسا** / c(i)zîre'asa/: ناو. کەرکە؛ کەرگراڤ؛ نیودوڕگە؛ سادوڕگە ☰ شبەجزیره

**جزیلک** / c(i)zîlik/: ناو. چزیلک؛ چزلیک؛ دووگی سوورەوەکراوی هەڵقرچاو ☰ جزغاله

**جزیە** / cizye/: ☜ **ساوەری**

**جسان** / c(i)san/: ☜ **زستان**

**جستان** / cistan/: ☜ **زستان**

**جسن** / cisin/: ئاوەڵناو. ۱. چاک؛ باش ۲. ڕەسەن؛ کەحێل (ئەسپ) ☰ ۱. خوب ۲. اصیل (اسب)

**جعیدۆک** / c(i)'îdok/: ناو. گیایەکە دژی مۆرانەی دار ☰ گیاهی ضد موریانه

**جعێتنی** / c(i)'êtnî/: ناو. جۆرێ ئەسپی ڕەسەن ☰ نوعی نژاد نجیب اسب

**جغار** / c(i)ğar/: ناو. جخار؛ خەم؛ خەفەت؛ مەینەت؛ کەسەر؛ کوڵ ‹... شل و شەکەت بە لارەلار، دڵ پڕ جغار، گیرفان بەتاڵ، بێتەوە ماڵ ... «هەژار، *چوار ناملکە*»› ☰ اندوه

**جغارە** / c(i)ğare/: ☜ **جگەرە**

⊡ **جغارە پێچانەوە**: ☜ **جگەرە پێچانەوە**

**جغارە کێشان**: ☜ **جگەرە کێشان**

**جغارەخۆر** / c(i) ğarexor/: ☜ **جگەرەکێش**

**جغارەکێش** / c(i) ğarekêş/: ☜ **جگەرەکێش**

**جغجغە** / ciğc(i)ğe/: ناو. شەقشەقە؛ قوتووی لەیستۆک کە خڕەخڕی دێت ☰ جغجغه

**جغز** / ciğz/: ☜ **جەغز**

**جغزانێ** / ciğzanê/: ناو. جغزێن؛ گاڵتەی ناو جەغز ☰ نوعی بازی

**جغزی** / ciğzî/: ئاوەڵناو. گوەل؛ خڕی ☰ مُدور

**جغزینگ** / ciğzîng/: ناو. پەرکاڵ؛ ئامرازی جەغز کێشان ☰ پرگار

**جغزێن** / ciğzên/: ☜ **جغزانێ**

**جغە** / c(i)ğe/: ناو. مووی تەوێڵ بە شێوەی چەتری ☰ موی چتری پیشانی

**جغەرە** / c(i)ğere/: ☜ **جگەرە**

**جغەرەچی** / c(i)ğereçî/: ☜ **جگەرەچی**

**جغەرەخۆر** / c(i)ğerexor/: ☜ **جگەرەکێش**

**جغەرەکێش** / c(i)ğerekêş/: ☜ **جگەرەکێش**

**جفت** / cift/: ☜ **جووت**

⊡ **جفت بون**: ☜ **جووت بون**

**جفت کردن**: ☜ **جووت کردن**

**جفتقۆشە** / ciftqoşe/: ☜ **جووتقۆشە**

**جفتک** / ciftik/: ☜ **جووتە**[۱]**ـ۱**

**جفتو** / ciftû/: ناو. کێبەرکێ؛ ململانێ ☰ مسابقه

**جفتە** / cifte/: ناو. ۱. ☜ **جووتە** ۲. ماشەی دەمبارێکی سەعاتسازان ۳. مێوینەی گیانەوەران ☰ ۱. ☜ **جووتە** ۲. موچین مانندِ ساعت‌سازی ۳. جنس مادەی جانوران

⊡ **جفتە وەشانن**: لەقە هاویشتن؛ جفتە هەڵخستن؛ لووشک هاویتن ☰ جفتک انداختن

**جفتە هەڵخستن**: ۱. ☜ **جفتە وەشانن** ۲. پا جفت کردن و باز بردن ☰ ۱. ☜ **جفتە وەشانن** ۲. جفت‌پا پریدن

**جفتە پا** / ciftepa/: ئاوەڵکار. جووت‌پا: ۱. کاری هەستانەوەی خێرا بۆ ڕێز نان ‹جفتەپا هەڵسام› ۲. *[مەجاز]* پتەو؛ قایم ‹جفتەپا لێم دا› ☰ ۱. قیام سریع به نشانەی احترام ۲. مُحکم

**جفته ـ جفته**[1] / ciftecifte/: ناو. بەزمی شانۆئاسای لۆتییان کە لە قەدیمدا بەڕێوە دەچوو ☰ نوعی نمایش مطرب‌های دوره‌گرد

**جفته ـ جفته**[2]: ئاوەڵکار. جووتە‌ـجووتە؛ دوان‌ـ دوان؛ بەجووت ☰ جُفت ـ جُفت

**جفتەوەشێن** / cifteweşên/: ☜ **جوتەوەشێن**

**جفتیار** / ciftyar/: ☜ **جوتیار**

**جفتێ** / ciftê/: ☜ **جوتە**[1]**ـ١**

**جفنە** / cifne/: ناو. تەشتی دارین بۆ هەویر شێلان ☰ تشت چوبی خمیرسازی

**جڤ** / civ/: ناو. بزاو؛ جوولە؛ لەپت ☰ حرکت

**جڤات** / c(i)vat/: ناو. ١. کار و ڕەوتی کۆ بوونەوە؛ کۆم بوون ٢. لێژنە؛ مەکۆ؛ کۆڕ ٣. کار و ڕەوتی ڕاپەڕین؛ بزووتنەوە ☰ ١. گردهمایی ٢. انجمن ٣. جنبش و قیام

**جڤاتگە** / c(i)vatge/: ناو. چڤاتگە؛ شوێنی کۆوە بوون ☰ محل گردهمایی

**جڤاتی** / c(i)vatî/: ناو. کۆماری؛ کۆمەڵی ☰ جمهوری

**جڤاکی** / c(i)vakî/: ئاوەڵناو. کۆمەلایەتی ☰ اجتماعی

**جڤان** / c(i)van/: چاوگ. کۆمەڵ بەستن ☰ جمع شدن

**جڤاندن** / c(i)vandin/: چاوگ. جەماندن؛ کۆمەڵ کردن؛ کۆ کردنەوە ☰ گرد آوردن

**جڤراندن** / civrandin/: چاوگ. ترساندن؛ زراو بردن ☰ ترساندن

**جڤک** / civik/: ☜ **جوملانە**

**جڤلین** / civlîn/: چاوگ. کەوڵ کردن؛ پێست لێ کردنەوە ☰ پوست کندن

**جڤنین** / civnîn/: چاوگ. بەستران (زمان و ...) لە ترسان ☰ بند آمدن (کلام و ...) از ترس

**جڤی** / c(i)vî/: ☜ **جوملانە**

**جڤیان** / civyan/: ☜ **جڤین**[1]

**جڤین**[1] / c(i)vîn/: چاوگ. جڤیان: ١. بزووتن؛ جوولان ٢. کۆ بوونەوە ☰ ١. جنبیدن ٢. گرد آمدن

**جڤین**[2]: ☜ **جنێو**

**جڤینگە** / c(i)vînge/: ناو. جێگەی کۆ بوونەوە ☰ مرکز اجتماع

**جق** / ciq/: ئامراز. ئامالّ؛ مەیلەو ☰ فام؛ مایل بە

**جقاندن** / c(i)qandin/: چاوگ. قیڕاندنی بۆق و باڵندان ☰ قار ـ قار کردن

**جقجقاندن** / ciqc(i)qandin/: چاوگ. ڕاوەشاندن ☰ تکان دادن

**جقجقە** / ciqc(i)qe/: ناو. خەرخەشە؛ شەقشەقە ☰ جغجغە

**جقجقین** / ciqc(i)qîn/: چاوگ. ڕاوەشان ☰ تکان خوردن

**جقلمبە** / c(i)qiłimbe/: ناو. سەرمەقولات؛ سەرموقولانج ☰ پُشتک

**جقە** / c(i)qe/: ناو. ١. مەلێکە تۆزێ لە چێشکە گەورەترە ٢. قیتکەی پشت پەنجەی کەڵەشێر ٣. مەنجەڵ؛ بەرۆش ٤. خشڵێک بۆ ڕازاندنەوەی کلاو یان تاجی سوڵتان و گەوران ‹تاقە گوڵی سووری جقەی دانشگات/ عەتری شەپۆل ئەدا ولات بە ولات «گۆران»› ☰ ١. پرنده‌ای اندکی بزرگتر از گنجشک ٢. برجستگی پشت پای خروس ٣. دیگ ۴. جقّه

**جک**[1] / cik/: ☜ **جگ**

**جک**[2]: ئاوەڵناو. قیت و قۆز؛ فیسن ‹لەو کوڕە خوەشم نایێ فرە جکە› ☰ قُد

**جکاندن** / c(i)kandin/: ☜ **جیکاندن**

**جککە** / cikke/: ناو. جککەبۆڕە؛ جککەبۆڕە؛ سریلە؛ زریلە؛ چۆڕە ☰ چکاوک

**جککەبۆرە** / cikkebore/: ☜ **جککە**

**جککەبۆڕە** / cikkeboře/: ☜ **جککە**

**جگ** / cig/: ناو. جک: ١. میچ؛ قاپ؛ چوو ٢. ورگی جگ؛ قاپی لە سەر پشت ‹ڕۆژێ بە موورادی منیش ئەلبەت دەگەڕێ چەرخ/ ئەم میچە قەراری نییە گاهێ جگە گەه بووک «شێخ ڕەزا»› ☰ ١. شتالنگ ٢. حالت بر پشت افتادەی شتالنگ

**جگا**[1] / c(i)ga/: ناو. جێ؛ جێگا ☰ جا

⊡ **جگا ئاسەی**: جێ هێشتن ☰ جا گذاشتن؛ رها کردن

**جگا**[2]: ئاوەڵناو. جیا؛ جودا؛ جیاواز ☰ جُدا

**جگا ـ جگا** / c(i)ga c(i)ga/: ئاوەڵکار. جیاـ جیا؛ بەش ـ بەش ☰ جُداـ جُدا

**جگارە** / c(i)gare/: ☜ **جگەرە**

**جگانێ** / c(i)ganê/: ناو. جگێن؛ گەمە بە جک ☰ بازی با شتالنگ

**جگمە** / cigme/: ☜ **جومگە**

**جگە** / c(i)ge/: ئامراز. بێجگە؛ بێژگە ‹حاسڵی تێگەیشتن و زانین/ چ بوو بۆ من جگە لە کوێرەوەری؟ «هێمن»› ☰ بجُز

**جگەر** / c(i)ger/: ☜ **جەرگ**

⊡ **جگەر سووتان**: ☜ **جەرگ سووتان**

**جگەرئۆتی** / c(i)ger'otî/: ناو. گیایەکە دەرمانی کۆکە ☰ گیاهی دارویی

**جگەرچی** / c(i)gerçî/: ناو. جگەری؛ فرۆشەری کەواوی جەرگ و دڵ ☰ جگرکی

**جگەرسۆز** / c(i)gersoz/: ئاوەڵناو. دڵۆڤان؛ غەمخۆر؛ دڵسۆز ☰ دلسوز

**جگەرسووتاو** / c(i)gersûtaw/: ئاوەڵناو. جەرگسووتاو: ١. داخدار؛ خەمبار ‹لە بادە ئەم ژەمە تێر کە منی تینووی جگەرسووتاو/ بە چی دیارە کە دەیبینم شەوێکی‌تر ژەمێکی‌تر «هێمن»› ٢. /مەجاز/ منداڵمردوو ☰ ١. داغدیدە ٢. فرزندمردە

**جگەرگۆش** / c(i)gergoş/: ☜ **جگەرگۆشە**

**جگەرگۆشە** / c(i)gergoşe/: ناو. جگەرگۆش؛ فرزەند؛ منداڵ ‹ڕۆژی سەلا، نە خزمانوو نە جگەرگۆشەکانیشتان هەرگیز دە فریاتان نایەن، لێکتان جودا دەکاتەوە و چی بیکەن خودا دەیبینێ «هەژار، قورئان»› ☰ فرزند

**جگەرە** / c(i)gere/: ناو. جخارە؛ جغارە؛ جغەرە؛ جگارە؛ سیگار؛ سگار؛ سیغار؛ سیار؛ تووتنی دەکاغەزەوە پێچراو بۆ کێشان ☰ سیگار

⊡ **جگەرە قامیش**: جۆرێ جگەرەیە لە کاغەزی تایبەتی دروست دەکرێ، وەک قامیش دەچێ ☰ نوعی سیگار دست‌پیچ

⊡ **جگەرە پێچانەوە**: جغارە پێچانەوە؛ سیگار پێچان ☰ سیگار پیچیدن

**جگەرە کێشان**: جغارە کێشان؛ سیگار کێشان ☰ سیگار کشیدن

**جگەرەچی** / c(i)gereçî/: ناو. جغەرەچی؛ جگەرەفرۆش ☰ سیگارفروش

**جگەرەخۆر** / c(i)gerexor/: ☜ **جگەرەکێش**

**جگەرەفرۆش** / c(i)geref(i)roş/: ☜ **جگەرەچی**

**جگەرەکێش** / c(i)gerekêş/: ئاوەڵناو. جغارەکێش؛ جغارەخۆر؛ جغەرەخۆر؛ جگەرەخۆر؛ جغەرەکێش ☰ سیگاری

**جگەری** / c(i)gerî/: ☜ **جگەرچی**

**جگێن** / c(i)gên/: ☜ **جگانێ**

**جل** / cil/: ناو. ١. گنج؛ بەرگ و لیباس ٢. بەرگی سەر پشتی بارەبەر ☰ ١. لباس ٢. جُل ستور

⊡ **جلە بووکە**: بەرگی بووک ☰ لباس عروس

**جلی کار**: بەرگی کار ☰ لباس کار

⊡ **جل شتن**: شیو و کڵ کردن؛ بالاف کرن؛ لیباس شۆردن ☰ رخت شُستن

**جلاوێز** / c(i)lawêz/: ناو. چێولیباسی؛ ئامرازێکە لە چێو یا ئاسن کە جلوبەرگی پێوە هەڵدەواسن ☰ چوبرختی

**جلبڕ** / cilbiř/: ناو. کەسێ شتومەک دەبڕێ بۆ

لیباس دروون 🇮🇷 بُرشکار پارچه

**جلبڕان** / cilb(i)řan/: ناو. جلبڕین؛ ڕەسم و یاسای کۆ بوونەوە بۆ بڕین و دروونی لیباسی بووک 🇮🇷 مراسم بُرش و دوخت لباس عروس

**جلبڕووکە** / cilb(i)řûke/: ناو. مزراویلکە؛ شۆرباوی سماق و هێلکە 🇮🇷 اشکنەی سُماق

**جلبڕین** / cilb(i)řîn/: ☜ جلبڕان

**جلجێوان** / cilcêwan/: ناو. پێخەف؛ سەرناز؛ جێگەوبان 🇮🇷 رختخواب

**جلخ** / cilx/: ناو. قەل؛ بۆقلە؛ قەلەموون 🇮🇷 بوقلمون

**جلخاندن** / cilxandin/: چاوگ. ئازراندن؛ ئازار دان 🇮🇷 آزار دادن

**جلخوەش** / cilx(i)weş/: ئاوەڵناو. لێهاتوو؛ چەلەنگ؛ فرز 🇮🇷 چابُک

**جلخۆز** / cilxoz/: ئاوەڵناو. گێل و نەزان 🇮🇷 هالو

**جلدان** / cildan/: ناو. ١. یەغدانی جلکان ٢. چارۆکەی سەر شان 🇮🇷 ١. صندوق لباس ٢. رودوشی

**جلدانین** / cildanîn/: چاوگ. جل ژبەر خوە کرن 🇮🇷 لباس پوشیدن

**جلدروو** / cild(i)rû/: ناو. بەرگدوور؛ خەیات 🇮🇷 خیاط

**جلدوور** / cildûr/: ناو. خەیات؛ بەرگدوور 🇮🇷 خیاط

**جلز** / c(i)liz/: ئاوەڵناو. لەڕ؛ لاواز 🇮🇷 ضعیف

**جلسافکەر** / cilsafker/: ناو. ناوەشکێنە؛ ئوتوو؛ چرچ‌لابەر؛ دەقاق 🇮🇷 اتو

**جلسە** / cilse/: ☜ جەلسە

**جلشڕ** / cilşiř/: ئاوەڵناو. جلکشڕ؛ تیقەلۆ؛ ڕینگاڵ؛ شڕۆڵ؛ بەرگدڕاو 🇮🇷 ژندەپوش

**جلشۆر** / cilşor/: ناو. ١. بالافکەر؛ کولکەر؛ کەیەک؛ گلارکۆ؛ گازر؛ قەسار؛ کەسێ کە جلک و گنجی خەڵک بە پارە دەشوا ‹لە بۆ نانێک و بۆ یەک تۆزە پێخۆر/ یەکێکیان بوو بە پالە و یەک بە جلشۆر «هێمن»› ٢. پەیاغی جل کوتان ٣. ئامێری کارەبایی جلشۆر 🇮🇷 ١. رختشور ٢. کُدینە ٣. ماشین لباسشویی

**جلشۆرک** / cilşorik/: ناو. ١. جێگەی بالاف؛ شوێنی بەرگ و شمەک شۆردن ٢. داری جلکوت 🇮🇷 ١. رختشویخانە ٢. کُدینە

**جلشۆری** / cilşorî/: ناو. بەراڤ؛ بالاف؛ شیو و کوڵ؛ کاری جلشۆر 🇮🇷 رختشویی

**جلشین** / cilşîn/: ناو. جلە؛ جلەشڕە؛ قەوزە؛ قۆزەقوڕواق؛ کەفزە؛ کەز؛ کەزی؛ کەژاو؛ کەژەوە؛ لمر؛ خوری پەچنە؛ کەوگی؛ گاوک؛ تیرەیەک ڕوەکی ساکاری ئاوژی 🇮🇷 خزە

**جلفڕ** / cilfiř/: ئاوەڵناو. [بلار] گەللایی؛ هەدانەدەر و شێتووکە 🇮🇷 ناآرام خُل‌مزاج

**جلفۆ** / cilfo/: ناو. پارچەیەکی سوور، بە سەر بازیدا ئەدەن تا کەوی دەبێ 🇮🇷 پارچەی قرمزی کە باز را با آن رام می‌کنند

**جلق** / cilq/: ئاوەڵناو. لەکارتە؛ خراپ 🇮🇷 ازکارافتادە

**جلقێ** / cilqê/: ئاوەڵناو. [ناشیرین] جنێوێکی ژنانە 🇮🇷 دشنامی زنانە

**جلک** / cilk/: ناو. جل؛ جنک؛ گنج؛ پۆشاک؛ لیباس؛ کەڵ‌وپەل ‹هات گوڕەی پیاوی لەمێژینە و دڕا جلکی هەژار/ کار و مەڕ هەر کاڕەیانە، بزنەڕووتەش هەڵبەزی! «ئاوات»› 🇮🇷 لباس؛ پوشاک

**جلکتازە** / cilktaze/: ئاوەڵناو. کۆک؛ تەڕپۆش 🇮🇷 خوش‌پوش

**جلکدروو** / cilkd(i)rû/: ناو. جلدروو؛ جلوراز؛ بەرگدروو 🇮🇷 خیاط

**جلکڕەش** / cilkřeş/: ئاوەڵناو. ڕەشپۆش 🇮🇷 سیاهپوش

**جلکشڕ** / cilkşiř/: ☜ جلشڕ

**جلکشۆر** / cilşor/: ناو. سیپاڵ‌شۆر 🇮🇷 رختشو

**جلکقەتیای** / cilkqetyay/: ئاوەڵناو. کەرپاڵ؛

قەرپاڵ؛ شڕ و شرۆڵ ▪ ژندەپوش

**جلگا** / cilga/: ناو. جۆرێک ماسی ▪ نوعی ماهی

**جللووت** / cillût/: ☜ **جلووت**

**جلنبۆر** / c(i)linbor/: ئاوەڵناو. [پەلار] تەمەڵ؛ تەوەزەل ▪ تنەلش

**جلنڤێژ** / ciln(i)vêj/: ناو. بەرماڵ؛ جانماز ▪ سجادەی نماز

**جلنگە** / c(i)linge/: دەنگەناو. دەنگی شکانی چینی ▪ صدای شکستن چینی

**جلوا** / cilwa/: ئاوەڵناو. سیس و ژاکاو ▪ پژمُردە

**جلوبەرگ** / cil û berg/: ناو. پۆشاک؛ پۆشەن؛ کەلپەلی دەبەرکردن ▪ پوشاک

**جلوجۆڕ** / cil û coř/: ناو. بەرگ و ئەسپابی ولاخی بارەبەر ▪ جُلِ باربر

**جلوجێوان** / cil û cêwan/: ناو. پێخەف؛ جێگەوبان ▪ رختخواب

**جلوراز** / cilw(i)raz/: ☜ **جلکدرو**

**جلووت** / c(i)lût/: ناو. جللووت؛ مەلێکە نزیک ١٧ سانتیمیتر دەبێ، مل و بەرزگی سپی، خاڵێکی گەورەی ئاماڵ نارنجی لە لاملە، دندووک و لاقی باریک و ڕەشە، پاییزان پشتی ڕێ ـ ڕێ دەبێ و لە قەراغ ئاو و گۆلاندا دەبینرێ ▪ فالاروپ گردن سرخ

**جلە** / c(i)le/: ناو. ١. جانەوەرێکی ئاوی هەشتپایە لە دەریادا ٢. جانەوەرێکی خڕ و پانە لە ئاودا، زیندەوەری چکۆلە ڕاو دەکا ٣. ڕەگ و ڕیشەی وردی دارەبی قەراغ ئاو کە پێش بە ئاو دەگرێ ٤. جلشین؛ گیایەکە وەک قەوزە سەر ئاو دەکەوێ و دەتەنێتەوە ٥. جلەلاوێن ▪ ١. اختاپوس؛ هشتپا ٢. جانوری آبزی بالشک مانند ٣. ریشەهای بید کنار آب ۴. جلوزغ ۵. نوعی انگل گیاهی

**جلەبووک** / c(i)lebûk/: ناو. کژۆت؛ بەرگی تایبەتی بووک لە شەوی زەماوەندیدا ▪ لباس عروسی

**جلەشڕە** / c(i)leş(i)ře/: ناو. جلە؛ جلشین؛ گیای قەوزە ئاسایی ▪ جلوزغ

**جلەگا** / c(i)lega/: ناو. مەرشک؛ پەلاسێ کە بە سەر پشتی گایدا ئەدەن ▪ جُل گاو

**جلەلاوێن** / c(i)lelawên/: ناو. گیایەکی زەردە لە داموسکە دەکا، خۆ لە گەلا و لاسکی وێنجە و بێستان دەهاڵێ و وشکی دەکا ▪ یک نوع انگل نباتی

**جلیت** / c(i)lît/: ☜ **جریت**

**جلیتباز** / c(i)lîtbaz/: ☜ **جریتباز**

**جلیتبازی** / c(i)lîtbazî/: ☜ **جریتان**

**جلیتقە** / c(i)lîtqe/: ☜ **جلیسقە**

**جلیسقە** / c(i)lîsqe/: ناو. جلیتقە؛ جلیقە؛ سەدرییە؛ سوخمەی بێقۆڵی پیاوانە ▪ جلیقە

**جلیق** / c(i)lîq/: ئاوەڵناو. لینج؛ لچق؛ لیقن ▪ لزج

**جلیقە** / c(i)lîqe/: ☜ **جلیسقە**

**جلێتانێ** / c(i)iêtanê/: ناو. تەقلە ▪ بازی سوارکاران با چوب کوچک

**جلێق** / c(i)lêq/: ناو. شیلان؛ نەستەرەن؛ دلێق؛ بەری دارێکی دڕکدارە ▪ ثمر نسترن کوهی

**جڵد** / ciłd/: ☜ **جەڵد**[1]

**جڵغە** / ciłğe/: ناو. ١. شوێنی پێوەندی تیغ و مشتووی خەنجەر و شمشێر ٢. جەغەتە؛ سەهۆڵی دەڵەمە ▪ ١. محل اتصال تیغ و دستەی شمشیر و خنجر ٢. یخ نیمبند

**جڵف** / ciłf/: ئاوەڵناو. سووک و چرووک؛ ئاکار ناشیرین ▪ قرتی؛ جلف

**جڵفبازی** / ciłfbazî/: ناو. حۆڕیاتبازاڕ ▪ جلفبازی

**جڵفە** / ciłfe/: ناو. زمانی سەرزارەکی (بەتایبەت عەرەبی) ‹چووم کتێبم لە ناو خۆڵ هەڵگرتەوە؛ داستانێک بوو بە عارەبی جلفەی ناو بەغدا نووسرابوو. زۆرم کەیف پێ هات کە زۆر وشەی بەغدایانەم فێر

دەکا. ڕەنگە بیست جارم خوێندبێتەوە! «هەژار، چێشتی مجێور» ☰ زبان گفتاری (بویژه عربی)

**جلفی** / cilfî/: ناو. هەرزەکاری؛ سووکی ☰ قرتی‌بازی

**جلق**[1] / ciłq/: ناو. دەسپەڕ؛ مشتە؛ مشتاو؛ کاری شاوەت هێنانەوە بە دەست ☰ استمنا؛ جَلق

**جلق**[2]: ئاوەڵناو. قەڵب؛ بێ‌ڕەواج ☰ بُنجُل

**جلقاو** / ciłqaw/: ناو. ئاوی ناخاوێنی شیو و کوڵ ☰ پساب رختشویی

**جلقەجلق** / ciłqeciłq/: دەنگەناو. زلقەزلق؛ دەنگی پێ لە نێو قوڕی شل و قوڕاو ☰ صدای پا در گل و لای شُل

**جڵەو** / c(i)łew/: ناو. جڵەوە؛ هەوسار؛ ڕەشمە؛ قامچی لغاو ‹پەروەردگارا عوزرم پەسند کە/ لە ڕاستی گوناه جلەوم توند کە «پیرەمێرد»› ☰ افسار؛ زمام

⊡ **جڵەو کێشان**: هەوسار کێشان ☰ زمام کشیدن

**جڵەودار** / c(i)łewdar/: ناو. ١. جڵەوکێش؛ هەوسارکێش ٢. کەسێ کە لە پێش سوارانەوە دەڕوا ☰ ١و٢. جلودار

**جڵەوشان** / c(i)łewşan/: ناو. ↓

⊡ **جڵەوشان کردن**: *[کنایه]* بەرەڵا کردن و بەرگری نەکردن ☰ یله کردن

**جڵەوکێش** / c(i)łewkêş/: ☜ **جڵەودار-١**

**جڵەوگیر** / c(i)łewgîr/: ناو. جڵەوگیرە؛ کۆسپی سەر ڕێگە ☰ سرعت‌گیر

**جڵەوگیرە** / c(i)łewgîre/: ☜ **جڵەوگیر**

**جڵەوە** / c(i)łewe/: ☜ **جڵەو**

**جلێتاو** / c(i)lîtaw/: ناو. قوڕ و چلپاو؛ قوڕاوی شل ☰ لای و لجن

**جلێق** / c(i)lîq/: ناو. پوان؛ شیلان؛ بەری شیلانەکێوی کە ڕوەکێکی دڕکاوییە ☰ ثمر نسترن کوهی

**جلێق**[1] / c(i)lêq/: ناو. شیلان؛ دڕکێکە لە پاییزدا پەڕێکی سوور دەگرێ ☰ نسترن کوهی

**جلێق**[2]: ئاوەڵناو. لیچق؛ لیلق؛ لینج ☰ لزج

**جم**[1] / cim/: ناو. بزاو؛ جرم؛ جووڵە؛ لەپت ☰ جنبش؛ تکان

⊡ **جم خواردن**: جووڵان ☰ تکان خوردن

**جم دان**: جووڵان ☰ تکان دادن

▪ **جم**[2]: پاشەوشە. ـ جمەوە ‹دێرجم؛ نەجم› ☰ ـ جُنب

**جمان**[1] / c(i)man/: چاوگ. تێنەپەڕ. //جمای؛ دەجمێی؛ بجمێ// جومان؛ بزووتن؛ جووڵان ☰ جُنبیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: جماو/ چاوگی نەرێنی: نەجمان

▪ **جمان**[2]: پاشەوشە. بزووتن ‹خوێن‌جمان› ☰ جُنبش

**جماندن** / c(i)mandin/: چاوگ. تێپەڕ. //جماندت؛ دەجمێنی؛ بجمێنە// جواندن؛ جمانن؛ بزواندن؛ وە ڕێ خستن ☰ جنباندن؛ حرکت دادن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەجماندن

**جمانن** / c(i)manin/: ☜ **جماندن**

**جمای** / c(i)may/: چاوگ. جمان؛ جووڵیان ☰ جنبیدن

**جمدان** / cimdan/: ☜ **جمشت**

**جمز** / cimiz/: ☜ **جمشت**

**جمژگە** / cimijge/: ☜ **جومگە**

**جمس** / cims/: ☜ **جمشت**

**جمش** / cimiş/: ☜ **جمشت**

**جمشت** / c(i)mişt/: ناو. جم؛ جووڵە؛ جمدان؛ جمس؛ جمێز؛ جمز؛ جمش؛ جوول‌جال ☰ جنبش؛ تکان

**جمشیرگ** / cimşîrig/: ☜ **جومگە**

**جمک** / cimk/: ☜ **جوملانە**

**جمکوت** / cimkut/: ناو. پڕبەپڕی ئاپۆرە؛ پڕایی زۆری خەڵک ☰ شدت ازدحام

⊡ **جمکوت بوون**: تەواو پڕ بوون لە خەڵک ‹شوێنەکە جمکوت بوو، دەرزیت داخستای نەئەکەفتە زەوی› 🇮🇷 پر شدن از مردم

**جمگە** / cimge/: ☜ **جومگە**

**جمگە ـ جمگە** / cimgecimge/: ئاوەڵناو. بەندبەندی ئەندام 🇮🇷 بند ـ بند اعضا

**جمنای** / cimnay/: چاوگ. ١. جووڵاندن؛ بزواندن ٢. جواندن؛ ڕاژەندن (بێشکە) 🇮🇷 ١. جُنباندن ٢. تکان دادن (گهواره)

**جمنایەرە** / cimnayere/: چاوگ. ئەرەجمنەی 🇮🇷 راه انداختن؛ راندن

**جموجوڵ** / cim û cûł/: ناو. چمچار ‹لە درەخت ئەدا شنەی بای سەحەر/ جموجووڵیەتی چەشنی سەودای سەر «گۆران»› 🇮🇷 جنب‌وجوش

**جمور** / c(i)mûr/: ناو. ژمور؛ حیسابی ڕۆژ و مانگ لە هەورامانی کۆندا 🇮🇷 نوعی تقویم در اورامان قدیم

**جمە**[1] / c(i)me/: ناو. ١. شلۆقی ٢. بزووت 🇮🇷 ١. ازدحام ٢. رانش

⊡ **جمە هاتن**: یکجار شلۆق بوون ‹بازاڕەکە جمەی ئەهات› 🇮🇷 جای سوزن انداختن نبودن

▪ **جمە**[2]: پاشەوشە. باری هاتنە جمین؛ بەرهەمی جمین ‹کەنەجمە› 🇮🇷 لرزش؛ رانش

**جمەجم** / c(i)mecim/: ناو. لەرەلەر؛ جموجووڵی نەرم و لە جێ خۆ ‹دوو لیمۆی وەش‌بۆش تەرحی شەمامە/ جمەجمشانە نە یەخەی جامە «سەیدی»› 🇮🇷 لرزش

**جمیان** / cimyan/: چاوگ. جووڵان؛ بزووتن 🇮🇷 جُنبیدن

**جمیای** / cimyay/: چاوگ. ڕاژان؛ هەلاژان 🇮🇷 درازکشیدن

**جمین** / c(i)mîn/: چاوگ. تێنەپەڕ. //جمیت؛ دەجمی؛ بجمە// بزووتن ‹وەک لەشکری مەل‌ومور/ ڕەش دەچوون دەجمین لە دۆور «هەژار، بۆ کوردستان»› 🇮🇷 حرکت کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: جمیو/ چاوگی نەرێنی: نەجمین

**جمێز** / c(i)mêz/: ☜ **جمشت**

**جمێن** / c(i)mên/: ☜ **جنێو**

**جن** / cin/: ناو. *[ئیسلام]* جند؛ جنۆکە؛ جندۆکە؛ جندووکە؛ ژنۆکە؛ عەجنە؛ ئەجنە؛ سەرکڕینک؛ بە بڕوای ئیسلامی بوونەوەرێکی نادیارە، باش و خراپیان هەیە 🇮🇷 جن

⊡ **جن کەسێک پێکان**: جنۆکە دەس لە کەسێک وەشاندن؛ ئاوەز تێکچوون؛ شێت بوون 🇮🇷 جن توی جلد کسی رفتن

**جناخە** / c(i)naxe/: ناو. کرمەک 🇮🇷 زیوری زنانه

**جنارە** / c(i)nare/: ناو. خەیارە؛ جۆرێ دمەڵ و کوان 🇮🇷 نوعی دُمل

**جناندن** / c(i)nandin/: چاوگ. جنین؛ ئەنجنین 🇮🇷 انجیدن

**جناوەر** / c(i)nawer/: ☜ **جانەوەر**

**جنجربەڵەک** / cincirbełek/: ئاوەڵناو. ئەبڵەق؛ بازگ؛ بازە؛ بازەڵە 🇮🇷 ابلق

**جن ـ جن** / cin cin/: ئاوەڵناو. ئەنجن ـ ئەنجن؛ تیکە ـ تیکە ‹ئەوەندەم غەم خوارد، غەم دلی بردم/ وەک کۆتەی قەساب جن ـ جن بوو جەرگم «فولکلۆر»› 🇮🇷 تکه ـ تکه

⊡ **جن ـ جن کردن**: هەنجن ـ هەنجن کردن 🇮🇷 تکه ـ تکه کردن

**جنجە** / cince/: ناو. توو؛ تۆم؛ ناوکە 🇮🇷 تُخمه

⊡ **جنجە تەقانن/ تەقاندن**: توو/ تۆم توکاندن ‹ڕووژی نیم کیلوو جنجە تەقنم!› 🇮🇷 تُخمه شکستن

**جنجیر** / cincîr/: ناو. ماری دوو ڕەنگ؛ ماری خاڵدار 🇮🇷 ارقم؛ مار دورنگ

**جنچک** / cinçik/: ناو. ١. دەنکی میوە ٢. جنچکە؛ قوونەڵتس؛ کاری هەڵتووتەکان ٣. پل؛ پلە گۆشت ☰ ١. هستە ٢. چُمباتمە ٣. چنجە

**جنچکان** / cinç(i)kan/: چاوگ. تووتەکان؛ هەڵترووشکان؛ قوونەڵتس دان ☰ چُمباتمە زدن

**جنچکە** / cinç(i)ke/: ☜ جنچك-٢

**جند** / cind/: ☜ جن

**جندرمە** / cindirme/: ☜ ژاندارم

**جندۆکە** / cindoke/: ☜ جن

**جندووکە** / cindûke/: ☜ جن

**جندە** / cinde/: ناو. *[ناشیرین]* جننە؛ جنە؛ جنێ؛ جونە؛ جوننە؛ قاحبە؛ خراپە؛ سۆزمانی؛ ژنێ کە بۆ پووڵ خۆی دەخاتە بەر حەزی پیاوان ☰ فاحشە

**جندەباز** / cindebaz/: ئاوەڵناو. *[ناشیرین]* جننەباز؛ فاسقی ئاشنای جندە ☰ جندەباز

**جندەخانە** / cindexane/: ناو. *[ناشیرین]* جننەخانە؛ جوننەخانە؛ ماڵەجندە؛ قاحبەخانە؛ ماڵێ کە ژن و پیاوی داوێن‌پیسی لێ جووت دەبن ☰ جندەخانە

**جندەیی** / cindeyî/: ناو. *[ناشیرین]* جننەیی؛ قاحبەیی؛ جندەگەری؛ خراپەکاری؛ کار، ڕەوت و پیشەی جندە ☰ فاحشگی

**جندی**[1] / cindî/: ناو. چەکدار لە سوپادا ☰ سرباز سپاه

**جندی**[2]: ئاوەڵناو. ١. ئازا؛ بەکار؛ ڕەشید ٢. جوان؛ سپەهی ٣. باش؛ خاس؛ چاک ☰ ١. شُجاع ٢. زیبا ٣. خوب

**جنراڵ** / ciniral/: ☜ ژێنراڵ

**جنران** / cinran/: چاوگ. تێنەپەر. نادیار. //جنرای؛ دەجنرێی؛ بجنرێ// جنیان؛ لەت‌وپەت بوون ‹شاهی عەرەبی یەعنی قورەیشی نەسەبی بێ/ جەرگم بە دوو ئەبرۆی ئەوە جنراوە دڵی من «بێخود»› ☰ انجیدە شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: جنراو/ چاوگی نەرێنی: نەجنران

**جنراو** / cinraw/: ئاوەڵناو. ئەنجن ـ ئەنجن‌کراو ☰ تکە ـ تکە شدە

**جنڕاڵ** / cinřał/: ☜ ژێنراڵ

**جنس** / cins/: ناو. ١. جنس؛ چییەتی یان چۆنیەتی بنەمایی ‹جنسی ئەمە زێڕە› ٢. بابەت؛ چین؛ جۆر؛ وێنە؛ چین و توێژ؛ گرۆیەک کە خاوەن تایبەتمەندی هاوبەشن ‹لەم جنسەم ناوێ› ☰ ١و٢. جنس

**جنقاندن** / cinqandin/: چاوگ. جەنقاندن؛ ترساندن ☰ ترساندن

**جنک** / cink/: ☜ جلك

**جنکە** / cinke/: ئاوەڵناو. ناتەواو هەنجنراو ☰ قدری انجیدە

**جنگ** / cing/: ناو. ١. جم؛ بزاو؛ جووڵە ٢. شمەک؛ کەل‌وپەل ☰ ١. جُنبش؛ تکان ٢. پوشاک

▣ **جنگ دان**: بزووتن؛ جووڵان ☰ جُنبیدن؛ تکان خوردن

**جنگر** / cingir/: ئاوەڵناو. جونگە؛ بەهانەگر ☰ بهانەگیر

**جنگز** / cingiz/: ئاوەڵناو. جنگوزی؛ جنگووزی؛ جنگزین؛ جنگن؛ شەڕانی؛ بەدفەڕ ☰ جوشی

**جنگزی** / cing(i)zî/: ناو. تووڕەیی؛ ڕک؛ قەڵسی ☰ غضب

**جنگزین** / cingizîn/: ☜ جنگز

**جنگل** / cingil/: ☜ جنگڵ

**جنگڵ** / cingił/: ناو. جنگل؛ گینگل؛ جووڵە ☰ جنبش؛ تکان

**جنگن** / cingin/: ☜ جنگز

**جنگنی** / cing(i)nî/: ناو. شەڕاشۆیی؛ دەم‌سووری ☰ ستیزەجویی

**جنگوجووڵ** / cing û c ûł/: ناو. دۆخـی بـزووتن و هەدا نەدان ☰ جنب‌وجوش

**جنگوزی** / cinguzî/: ☜ جنگز

**جنگووزی** / cingûzî/: ☜ جنگز

**جننه** / cinne/: ☜ جنده

**جننه‌باز** / cinnebaz/: ☜ جنده‌باز

**جننه‌خانه** / cinnexane/: ☜ جنده‌خانه

**جننه‌یی** / cinneyî/: ☜ جنده‌یی

**جنۆکه** / c(i)noke/: ☜ جن

◘ **جنۆکـه دەس لـه کەسـێک وەشـاندن**: ☜ جـن کەسێك پێكان

**جنه** / cine/: ☜ جنده

**جنه‌نار** / c(i)nenar/: ناو. جن‌هەنار ☰ انار وحشی

**جن‌هەنار** / cinhenar/: ☜ جنه‌نار

**جنیاگ** / cinyag/: ئاوەڵناو. هـەنجناو؛ وردکـراو ☰ انجیده

**جنیان** / cinyan/: ☜ جنران

**جنیچکـه** / c(i)nîçke/: نـاو. ونـدەکی؛ تـوولنج؛ تووتەک؛ قوونەڵتس ☰ چُمباتمه

**جنیقین** / c(i)nîqîn/: چاوگ. ڕاپەڕین؛ داچلەکان؛ لەپڕ وە خەبەر هاتن ☰ از خواب پریدن

**جنیک** / c(i)nîk/: ناو. ۱. لاجانگ؛ قەراغ ڕوومـەت ۲. گودلە؛ فڕ ۳. بان مەلاشوو ☰ ۱. عذار ۲. کاکُل روی پیشانی ۳. آهیانه

**جنین** / c(i)nîn/: چاوگ. تێپەڕ. //جنیـت؛ دەجـنی؛ بجنـە// هـەنجنین؛ پارچـە ـ پارچـە کـردن ☰ انجیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەجنین

**جنێ** / c(i)nê/: ☜ جنده

**جنێر** / c(i)nêr/: ناو. ئاسۆ ‹مانگ تازە لـە جنێـرەوە سەری دەرهێنابوو› ☰ افق

**جنێـو** / c(i)nêw/: نـاو. جڤـین؛ جمـێن؛ جـوین؛ جوێن؛ جوون؛ دژمان؛ دژمانی؛ دوژمان؛ دشمان؛ دوشمین؛ دژنام؛ دژون؛ دژوون؛ دوژوین؛ دژووین؛ دژوێن؛ دمژین؛ دژمین؛ دژمێن؛ دوژمـین؛ ژنێـو؛ ژوون؛ ڤـێس؛ چێـڕ؛ سـکان؛ سـخیف؛ سـخێف؛ سقێف؛ خەراو؛ خراو؛ ناخـاس؛ خوسـن؛ خۆسـن؛ خوەسـن؛ خەسـن؛ خەبـەر؛ فـاش؛ نـاو یـان ناونیتکەیەک بۆ سووکایەتی کردن بـە کەسـێک ‹تـا چەنـە شـل بـوون چەقـە و جنێـوە/ ئـەمجار شەڕەشەق ئەچێ بەڕێوە! «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ دُشنام

◘ **جنێو دان**: جـوێن/ دژوێـن دان؛ خـەراو وتـن؛ سـخێف‌گـوتن؛ ڤـیلین؛ سـەکانن؛ سـکانن؛ ڤێسـین؛ هەڵسـکاندن؛ دژمـان دای؛ ششـتن؛ شتن؛ شوست‌وشۆ دەرێنان ☰ دشنام دادن

**جنێوبـازی** / c(i)nêwbazî/: ناو. فـڕاوێژی؛ کـەترە؛ فڕ؛ هەجو ‹تۆ کە خۆت مـەیلی جنێوبـازی دەکـەی شێخ سالح!/ بـۆ دەکـەی سەرزەنشـی مـن کـە ڕەزا هـەجاوە؟ «شـێخ ڕەزا»›. هـەروەها: **جنێوبـاز** ☰ هجو

**جنێـــــوفرۆش** / c(i)nêwf(i)roş/: ئاوەڵـــــناو. جوێنفرۆش؛ زمان‌پیس؛ جوێن‌دەر؛ سـخێف‌بێـژ. هەروەها: **جنێوفرۆشی** ☰ بدزبان

**جـواب** / c(i)wab/: نـاو. جـاب؛ جـواو؛ جـەواب؛ پەرسڤ؛ وەلام؛ ولام؛ وەرام ‹جوابـی دەهـۆڵ‌ژەن سرناژەن ئەیداتەوە «مەسەل»› ☰ جواب؛ پاسخ

◘ **جـواب دان**: جـــواو دان: ۱. وەلام دانـــەوە ۲. دەرکردن ☰ ۱. پاسخ دادن ۲. بیرون کردن

**جـواب دانـەوە**: جـواو دانـەوە؛ پەرسـڤ وەدان؛ جواب لێ وەگەڕاندن ☰ پاسخ گفتن

**جواب کردن**: جواب دان؛ جـواوکردن؛ دەرکـردن ☰ جواب کردن

**جوابـدەر** / c(i)wabder/: ناو. جواودەر؛ وەلامـدەر؛ وەرامدەر ☰ پاسخگو

**جوابنامـه** / c(i)wabname/: نـاو. قاقـەزی جـواب

دانەوە 🇮🇷 پاسخنامە

**جوابەجەنگێ** / c(i)wabecengê/: ناو. جواوجوی؛ شەڕەقسە؛ کاری بە دەمدا هاتنەوە 🇮🇷 جَدَل

**جوات** / c(i)wat/: ناو. ١. کۆ؛ کۆمەڵ ٢. جڤات؛ کاری کۆ بوونەوە ٣. جڤات؛ ئەنجومەن؛ کۆمەڵگا ٤. جڤات؛ کاری ڕاپەڕینی بە کۆمەڵ 🇮🇷 ١. اجتماع ٢. گردهمایی ٣. انجمن ۴. شورش

**جوادە** / c(i)wade/: ناو. جۆرێ مەشکەی ئاو 🇮🇷 نوعی مشک آب

**جوار** / c(i)war/: ☜ **جۆرك ـ١**

**جوال** / c(i)wal/: ☜ **جواڵ**

**جواڵ** / c(i)wał/: ناو. جەواڵ؛ جەواڵە؛ جوال؛ جوهال؛ جەولخ؛ کیسەی گەورەی یەکلایی لە خوری چندراو بۆ دەغڵ 🇮🇷 جوال

**جواڵدۆز** / c(i)wałdoz/: ناو. سووژن؛ شووژن 🇮🇷 جوالدوز

**جوامیر** / c(i)wamîr/: ☜ **جوامێر**

**جوامێر** / c(i)wamêr/: ئاوەڵناو. جامێر؛ جوانمەرد؛ جوانمێر؛ جوامیر؛ جۆمەرد؛ شەجۆ؛ شامبۆز؛ مەردەمێر؛ مەردوڕەند؛ پیاوخاس؛ مێرخاس؛ دلاوا؛ بە ئاکار و خدەی چاکەوە (وەک: بەخشین، دەستگری لە هەژاران، ئازایی و لێبووردوویی) ‹ئەسکەندەری ناو بوو بابی جوامێر/ بیستوومە عەرەب پێیان دەگوت شێر «هەژار، مەم و زین»› 🇮🇷 جوانمرد؛ رادمرد

**جوامێرانە** / c(i)wamêrane/: ئاوەڵناو. پیاوانە؛ مەردومەردانە 🇮🇷 جوانمردانە

**جوامێری** / c(i)wamêrî/: ناو. جامێری؛ پیاوەتی؛ مرۆڤایەتی؛ مەردایەتی 🇮🇷 جوانمردی

**جوان**[1] / c(i)wan/: ناو. ١. وادە؛ ژوان؛ بەڵێندراو ٢. لاو؛ گەنج؛ جحێڵ ‹جوان، کوێرە و چاڵ نابوێرێ «مەسەل»› 🇮🇷 ١. میعاد ٢. جوان

**جوان**[2]: ئاوەڵناو. ١. سپەهی؛ دەلال؛ قەشەنگ ٢. لاو؛ جحێڵ؛ تازە پێگەیشتوو ٣. لەبار؛ گونجاو؛ پەسند 🇮🇷 ١. زیبا ٢. بُرنا؛ جوان ٣. پسندیده

**جواناو**[1] / c(i)wanaw/: ناو. ئارەقی سەرەمەرگ؛ خۆهـ دانی نەخۆشی لە مردن ‹لە تاو گیانکەنشت دەم داچەقینی/ لە گۆنای زەردی جواناو بڕژێنێ «قانع»› 🇮🇷 عرق حال نزع

**جواناو**[2]: ئاوەڵناو. تازەنریاگ؛ تازەئاودراو ‹شەتڵی جوانام منی ساردەبرین/ کوا خەجم تا بۆم بگێڕێ گەرمەشین؟ «هێمن»› 🇮🇷 نونهال

**جوانپەرست** / c(i)wanperist/: ئاوەڵناو. شەیدای جوانی ‹جوانپەرستم، جوانپەرستم/ بە دیداری جوانان مەستم «هێمن»› 🇮🇷 زیباپرست

**جوانچاک** / c(i)wançak/: ئاوەڵناو. جوانچاڵ؛ خوشیک؛ سپەهی ‹کیژی لادییی نەشمیلی جوانچاک/ بێ‌فڕوفێڵ و هێدی و داوێن‌پاک «هێمن»› 🇮🇷 زیباروی

**جوانچاڵ** / c(i)wançał/: ☜ **جوانچاك**

**جوانخاس** / c(i)wanxas/: ئاوەڵناو. پێکەوتوو؛ جوان و لەبار؛ زۆر جوان و ڕێکوپێک 🇮🇷 خوش‌تیپ

**جوانخاسی** / c(i)wanxasî/: ناو. شەوکەت؛ جوانچاکی 🇮🇷 جمال

**جواندن** / c(i)wandin/: ☜ **جماندن**

**جوانشیرین** / c(i)wanşîrîn/: ئاوەڵناو. پێکەوتوو؛ بەرکەتی 🇮🇷 برازندە؛ خوش‌تیپ

**جوانك** / c(i)wanik/: ناو. عازەبی؛ زیپکە 🇮🇷 جوش غرور

**جوانکار** / c(i)wankar/: ئاوەڵناو. ١. ڕازێنەوە؛ بووک جوانکەر ٢. دەس‌نەخشین؛ دەس‌ڕەنگین؛ هونەرمەند 🇮🇷 ١. آرایشگر ٢. هنرمند

**جوانکاری** / c(i)wankarî/: ناو. ١. کار و ڕەوتی ڕازاندنەوە ٢. دەس‌ڕەنگینی 🇮🇷 ١. آرایش ٢. هنرمندی

**جوانکە** / c(i)wanke/: ناو. نۆجوان؛ تازەلاو ☰ نوجوان

**جوانکەر** / c(i)wanker/: ناو. ڕازێنەوە؛ وەڕازێن ☰ آرایشگر

**جوانکەڵە** / c(i)wankełe/: ☜ جوانکیلانە

**جوانکیلانە** / c(i)wankîlane/: ناوەڵناو. جوانکەڵە؛ جوانکیلە؛ چکۆڵەی جوان و لەبەردڵ ☰ کوچولوی زیبا

**جوانکیلە** / c(i)wankîle/: ☜ جوانکیلانە

**جوانمەرد** / c(i)wanmerd/: ☜ جوامێر

**جوانمێر** / c(i)wanmêr/: ☜ جوامێر

**جوانن** / c(i)wanin/: چاوگ. بزواندن؛ جوولانن ☰ جنباندن

**جواننوسی** / c(i)wannûsî/: ☜ خۆشنوسی

**جوانو** / c(i)wanû/: ناو. جانک؛ جانوو؛ جانی؛ جانیک؛ جوانی؛ بێچووی ئەسپ و ماین ☰ کُرّە اسب

▣ **جوانو ئەسپ:** جانوو ئەسپ؛ بەچکەی نێری ئەسپ ☰ کُرّەی نر اسب

**جوانو ماین:** جانوو مایین؛ بەچکەی مێوینەی ئەسپ ☰ کُرّەی مادینەی اسب

**جوانولکە** / c(i)wanûlke/: ناو. جانووی تازەزاو ☰ نوزاد اسب

**جوانە** ـ / -c(i)wane/: پێشوشە. جەوان؛ تازە ‹جوانەگا› ☰ جوان

**جوانەزرۆ** / c(i)wanez(i)ro/: ☜ جوانەزووە

**جوانەزمە** / c(i)wanez(i)me/: ☜ جوانەزووە

**جوانەزوە** / c(i)wanez(i)we/: ☜ جوانەزوە

**جوانەزۆ** / c(i)wanezo/: ☜ جوانەزووە

**جوانەزووە** / c(i)wanezûwe/: ناو. جوانەزرۆ؛ جوانەزۆ؛ جوانەزوە؛ جوانەزمە؛ جوانەزەوە؛ جوانەژۆ؛ عازەوی؛ زیپکەی دەم و چاوی لاوی تازە پێگەیشتوو ☰ عزبی؛ جوش صورت نوجوانان

**جوانەزەوە** / c(i)wanezewe/: ☜ جوانەزووە

**جوانەژۆ** / c(i)wanejo/: ☜ جوانەزووە

**جوانەگا** / c(i)wanega/: ناو. جانەگا؛ جونەگا؛ جەل؛ بەرجووت؛ گای سێ بەهارە ☰ گاو نر سە سالە

**جوانەگوڵ** / c(i)waneguł/: ناو. گوڵەکەتان؛ هەمیشەبەهار؛ ناوی چەن جۆر گوڵەمەیموون بە لقی نەرم و داشۆڕاو و گوڵی بنەوشەوە ☰ گُل کتانی

**جوانەمەرگ** / c(i)wanemerg/: ناوەڵناو. چەلەپەر؛ بە گەنجی مردوو ☰ جوانمرگ

**جوانەمەرگی** / c(i)wanemergî/: ناو. مەرگی بێوەخت؛ مردن بە لاوەتی ‹ئەو پێش پشکووتن سیس بووە/ بە جوانەمەرگی مردووە «هێمن»› ☰ جوانمرگی

**جوانی** / c(i)wanî/: ناو. ۱. ☜ جوانو ۲. خوشیکی؛ قەشەنگی ‹من ئەڵێم: هەتاهەتایە دەوری جوانییە «سوارە»› ۳. جحێڵی؛ لاوی ‹شەوی بەهاری جوانی خەوێ بوو، پرتەشویر/ لە فەجری پاییزی پیری بەیانی دا تەعبیر «نالی»› ☰ ۱. ☜ جوانو ۲. زیبایی ۳. جوانی

**جوانیناسی** / c(i)wanînasî/: ناو. زاراوەیەکی هونەری، واتە ناسینی جوانییەکان لە ئەدەب و هونەردا ☰ زیباییشناسی

**جواو** / c(i)waw/: ☜ جواب

▣ **جواو دان:** ☜ جواب دان

**جواو دانەوە:** ☜ جواب دانەوە

**جواو کردن:** ☜ جواب کردن

**جواوجوی** / c(i)wawcuy/: ☜ جوابەجەنگی

**جواودەر** / c(i)wawder/: ☜ جوابدەر

**جواهێر** / c(i)wahêr/: ناو. گەوهەر؛ بەردی بەنرخ ☰ جواهر

**جواهێربەن** / c(i)wahêrben/: ناوەڵناو.

گەوهەربەند؛ بە جەواهێر ڕازێنراوەوە ☰ جواهربند

**جوبرایل** / cubrayil/: ناو. /ئیسلام/ ناوی فریشتەی وەلامبەری خودا ☰ جبرئیل

**جوبرک** / cubiřk/: ☜ **جۆبڕ**

**جوترّاو** / cutraw/: ☜ **جوراو**

**جوتیار** / cutyar/: ☜ **جوتیار**

**جوجاگە** / cucage/: ناو. ماستۆیید؛ ئێسکی پشتەگوێ ☰ استخوان پشت گوش؛ ماستوئید

**جوجمین** / cucmîn/: چاوگ. تۆپین ☰ سقط شدن

**جوجوش** / cucuş/: ناو. میوانی؛ قەیماخ؛ ئارد و ڕۆن کە بۆ ژنی زەیستانی لێدەنێن ☰ اوماج

**جوجو** / cucû/: ☜ **ججو**

**جوحتک** / cuĥtik/: ☜ **جوتە١ـ١**

**جودا** / cuda/: ئاوەڵناو. جیا؛ جیاواز؛ جگە ‹عاشق دڵی نایێ لە دلارامی جودا بێ/ ئەلبەت کە دلارامی لەوێ بێ، دڵی نایێ «نالی»› ☰ جُدا؛ سَوا

**جودایەز** / cudayez/: ☜ **جیاواز**

**جودایەزی** / cudayezî/: ☜ **جیاوازی**

**جودایی** / cudayî/: ناو. جیایی: ١. جیاوازی؛ فەرق ٢. چۆنیەتی لێک دوورکەوتنەوە ‹نابێ قەت نالەی جودایی بێئەسەر/ جا چ نەی بیکا چ پیاوی دەربدەربەدەر «هێمن»› ☰ ١. تفاوت ٢. فِراق؛ جدایی

**جوداییخواز** / cudayîx(i)waz/: ☜ **جیاخواز**

**جوداییخوازی** / cudayîx(i)wazî/: ناو. جیاخوازی؛ جیاییخوازی؛ ویست یان چالاکییەک بۆ جیا کردنەوەی بەشێک لە وڵاتی ژێردەسەڵاتی دەوڵەتێک و سەربەخۆ کردنی ☰ تجزیەطلبی

**جودۆ** / cudo/: ناو. جۆرێک زۆرەبانێ بۆ خۆ پاراستن کە لە ڕۆژهەلاتی دوورەوە هاتووە ☰ جودو

**جودۆکار** / cudokar/: ناو. کەسێ کە لە وەرزەشی جودۆدا کارامەیە ☰ جودوکار

**جوران** / curan/: چاوگ. تێپەڕ. نادیار. //جورای؛ دەجوریێ؛ بجورێ// کەوتنە بەر جوونەوە ☰ جویدە شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: جوراو/ چاوگی نەرێنی: نەجوران

**جوراو** / curaw/: ئاوەڵناو. جاوراو؛ جاویاو؛ جاویاگ؛ جوتراو ☰ خاییدە

**جوربزە** / curb(i)ze/: ناو. ئازایەتی؛ وره ☰ شهامت

**جور • جور** / cur cur/: ئاوەڵناو. جۆراوجۆر ☰ جوراجور

**جورڕە** / cuře/: ☜ **جورە-٣**

**جورڕەماسی** / cuřemasî/: ناو. جۆرێک ماسی ☰ نوعی ماهی

**جوڕنا و فڕنا** / cuřnawfiřna/: ناو. /یلار/ وڕاوە؛ وڕینە ☰ هزیان

**جوڕنە** / cuřne/: ناو. خەزێنە؛ حەوزۆکەی حەمام کە ئاوی گەرمی بۆ خۆ شتن تێ دەکەن ☰ خزینەی حمام

**جورە** / cuře/: ناو. ١. کلاونە؛ چۆلەکەئاسایەکی ڕەنگ بۆری ئامالزەردی سەر بە کلاوەیە ٢. بازی نێر ٣. جورڕە؛ جورەمراوی؛ خوردەک؛ مەلێکە لە خێزانی مراوییەکان لە هەموویان چکۆلەترە، نێری سەری خەنەییە و خەتی کەسکی بە سەر چاودا کشاوە، سەر شانی خەتی سپی پێدا هاتووە. مێیەکانی خاڵخاڵن. زۆر تیژباڵن، بە پۆل دەگەڕێن، نەوی دەفڕن، لە جۆبار و قامیشەڵاندا دەژین. ☰ ١. چکاوک ٢. باز نر ٣. خوتکا

⊡ **جورە ناڵ کردن**/کینایە/ فێڵ و گزی کردن ☰ کلاهبرداری کردن

**جورە نان** خەبەر دان ☰ گزارش دادن

**جورەپۆپنە** / cuřepopne/: ناو. جورەپۆپنەکی؛ باڵدارێکە لە چۆلەکە گەورەترە و کاکۆلی هەیە ☰ چکاوک کاکلی

**جوره‌پۆپنه‌کی** / cuřepopnekî/: ☜ **جوره‌پۆپنه**

**جوره . جوره** / cure cuře/: ئاوه‌ڵناو. جۆربه‌جۆر؛ جۆراوجۆر ☰ جوراوجور

**جوره‌قازاخی** / cuřeqazaxî/: ناو. جوره‌قازلاخی؛ جۆرێ جوره‌یه له جوره‌كلاونه گه‌وره‌تر و ده‌نگی زۆر خۆشه ☰ نوعی چکاوک خوش نوا

**جوره‌قازڵاخی** / cuřeqazłaxî/: ☜ **جوره‌قازاخی**

**جوره‌کڵاونه** / cuřek(i)ławne/: ☜ **چوره**

**جوره‌مراوی** / cuřem(i)rawî/: ☜ **جوره-۳**

**جوره‌مێرگی** / cuřemêrgî/: ناو. جۆرێک جوره‌یه له جوره‌كلاونه و جوره‌قازلاخی چکۆله‌تره و کڵاوی نییه ☰ نوعی چکاوک

**جوری** / cuřî/: ناو. جۆرێ ماسی ☰ نوعی ماهی

**جوز** / cuz/: ☜ **جوز**

**جوستوجۆ** / cust û co/: ناو. جوس‌وجۆ؛ کرۆکاش؛ کار و ڕه‌وتی دانه‌په‌ی؛ به شوێندا گه‌ڕان ☰ جستجو

**جوسته** / custe/: ناو. په‌راوێزی لێفه؛ قه‌راغ لێفه ☰ حاشیه‌ی لحاف

**جوس‌وجۆ** / cus û co/: ☜ **جوستوجۆ**

**جوعمه** / cu'me/: ☜ **جومعه**

**جوغز** / cuğz/: ☜ **جه‌غز**

**جوفت** / cuft/: ☜ **جووت**

**جوفته‌لی** / cuftelî/: ئاوه‌ڵناو. *[پلار]* جووته‌هاوێژ؛ له‌قه‌وه‌شێن ‹ڕه‌قیبی جوفته‌لی نابێته نه‌خچیرت که خه‌رکوڕه/ ئه‌لیفی چایره دائیم له قه‌شقه‌ی که‌ردڕ و جه‌ودا «نالی»› ☰ جُفتک‌پران

**جوق** / cuq/: ناو. کۆمه‌ڵ؛ ده‌سته ☰ دسته؛ گروه

⊡ **جوق به‌ستن**: کۆ بوونه‌وه؛ ده‌سته ـ ده‌سته بوونه‌وه ‹کچگه‌ل جوقیان به‌ست چوون بۆ هه‌لامه «فولکلۆر»› ☰ گروه ـ گروه شدن

**جوققه** / cuqqe/: ناو. جوقنه؛ جوقه؛ مه‌لێکی بۆره له چۆله‌که بچووکتر، زیاتر له نێو قۆرغ و قۆپیدا ده‌ژی ☰ پرنده‌ای کوچک که در بیشه‌زارها زندگی می‌کند

**جوقنه** / cuqne/: ☜ **جوققه**

**جوقه** / cuqe/: ناو. ۱. ☜ **جوققه** ۲. شڵی له شێوه‌ی گوڵ، خۆر یان مانگ بۆ ڕازاندنه‌وه‌ی به‌ره‌وه‌ی کڵاو و کولیلک ☰ ۱. ☜ **جوققه** ۲. جُقّه

**جول**[1] / cul/: ناو. ۱. جله بارەبەر ۲. پەلاس؛ پلاس؛ تەشکەبەرە ☰ ۱. جُل باربر ۲. پلاس

**جول**[2]: ئاوه‌ڵناو. ڕه‌وان ☰ جاری

**جومان** / cuman/: چاوگ. ۱. ☜ **جمان** ۲. به ڕه‌گا هاتن؛ بزووتنی شیری ناو مه‌مک ☰ ۱. ☜ **جمان** ۲. تراوش کردن شیر در سینه

**جومبووش** / cumbûş/: ناو. جم‌وجوول ☰ جنب‌وجوش

**جومرانه** / cumřane/: ☜ **جومڵانه**

**جومعانه** / cum'ane/: ناو. خێری خه‌ڵک به مجێور و فه‌قێ له ڕۆژی هه‌ینی ‹جومعانه براوه به خودا موفلیسه لامیع/ نێ پوولی حه‌مامی هه‌یه نێ پاره‌یی تووتن «شێخ ڕه‌زا»› ☰ کمک هر جمعه‌ی مردم به خادم مسجد

**جومعه** / cum'e/: ناو. هه‌ینی؛ ئه‌ینی؛ جوعمه؛ ڕۆژی پشوودان له زۆربه‌ی وڵاته ئیسلامییه‌کاندا ☰ آدینه؛ جمعه

**جومگه** / cumge/: ناو. جگمه؛ جمژگه؛ جمشیرگ؛ جمگه؛ جونگه؛ جۆگمه؛ جه‌مگه؛ گه؛ خرکه؛ بەند؛ برگه؛ له‌یم؛ مۆڤک؛ جه‌مسه‌ری دوو ئێسکی به یه‌ک گه‌یشتوو ☰ مَفصَل

**جومله** / cumle/: ناو. ده‌سه؛ تاقم ☰ دسته

**جومڵانه** / cumłane/: ئاوه‌ڵناو. جومرانه؛ جفی؛ جفک؛ جمک؛ جویک؛ جێمک؛ جێوک؛ ئاواڵ‌دوانه ☰ دوقلو

**جومێ‌ته‌نکه** / cumêtenke/: ☜ **جاڵجاڵۆکه**

**جون** / cun/: ناو. ئاونگ؛ هارەگل 🇮🇷 هاون سنگی

**جونگ** / cung/: ناو. ١. ڕک؛ تووڕەیی؛ قەلسی؛ ڕق ٢. چونگ؛ گیایەکی گوڵزەردی بۆنخۆشە 🇮🇷 ١. خشم ٢. گیاهی خوشبو

**جونگە**[1] / cunge/: ☜ **جومگە**

**جونگە**[2]: ئاوەڵناو. ١. جنگر؛ بەهانەگر ٢. تووش؛ شەمبۆز 🇮🇷 ١. بهانەگیر ٢. چموش

**جونگە**[3]: دەنگەناو. جووکە؛ دەنگی باریکی ناخۆش 🇮🇷 صدای زیر و موذی

**جوننە** / cunne/: ☜ **جندە**

**جوننەخانە** / cunnexane/: ☜ **جندەخانە**

**جونە** / cune/: ناو. ١. مەلێکی پچووکی ڕەنگاوڕەنگە ٢. ☜ **جندە** 🇮🇷 ١. سیرە ٢. ☜ **جندە**

**جونەگا** / cunega/: ☜ **جوانەگا**

**جوە** / c(i)we/: ناو. کراس؛ گجی؛ متیان 🇮🇷 پیراهن

**جوەدرەو** / c(i)wed(i)rew/: ناو. گوڵان؛ بانەمەڕ 🇮🇷 اردیبهشت

**جوەدەری** / c(i)wederî/: ناو. سوالکەری؛ گەدایی 🇮🇷 گدایی

**جوەلە** / c(i)wele/: ☜ **جۆگە ـ١**

**جوهال** / cuhal/: ☜ **جوال**

**جوهاڵ** / cuhał/: ☜ **جهاڵ**

**جوی** / c(i)wî/: ئاوەڵناو. هامزا؛ هاوالدوانە؛ لفەودوانە 🇮🇷 همزاد

**جویزنای** / c(i)wîznay/: ☜ **جوزاندن**

**جویزیای** / c(i)wîzyay/: ☜ **جوزان**

**جویک** / c(i)wîk/: ☜ **جوملانە**

**جوین**[1] / c(i)wîn/: چاوگ. تێپەڕ. //جویت؛ دەجوی؛ بجوە// ١. جمین؛ بزووتن؛ جوولان ٢. ☜ **جاوین** 🇮🇷 ١. جُنبیدن ٢. ☜ **جاوین**

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: جویو/ چاوگی نەرێنی: نەجوین

**جوین**[2]: ☜ **جنێو**

**جوێ** / c(i)wê/: ئاوەڵناو. جودا؛ جیا ‹لە هەر شیعرێ لە دیوانت دەجۆشێ نەشئەیێ مەحوی!/ سەدایێکی لە یەکتر جوێ دەدا هەر تاری قانوونت «مەحوی»› 🇮🇷 جدا

◘ **جوێ بوونەوە**: جیا بوونەوە: ١. لێک‌هەڵبڕان؛ دوور کەوتنەوە ‹لە ئاخریدا من و هەژار بە تەواوی لە تاقمی کوڕە شێخەکان جوێ بووینەوە و شەو و ڕۆژ خەریکی شیعر خوێندنەوە بووین «هێمن»› ٢. ماڵ جیا کردنەوە ‹منداڵەکانی گەورەن، هەموو جوێ بوونەتەوە و ماڵی خۆیان هەیە› 🇮🇷 ١. جدا شدن ٢. مُستقل شدن از خانەی پدری

**جوێ کردنەوە**: جیاواز کردن؛ هەڵاواردن 🇮🇷 جُدا کردن

**جوێن** / c(i)wên/: ☜ **جنێو**

◘ **جوێن دان**: ☜ **جنێو دان**

**جوێندەر** / c(i)wênder/: ☜ **جنێوفرۆش**

**جوێنفرۆش** / c(i)wênf(i)roş/: ☜ **جنێوفرۆش**

**جۆ**[1] / co/: ناو. ١. جە؛ جەهـ؛ جاو؛ جیو؛ جوویە؛ یەو؛ یەوە؛ ئێو؛ جۆو؛ جوو؛ گیایەکە لە بنەماڵەی گەنم و پەڕشت؛ دەنکەکانی سپی و توێکڵدارە، پێش گەنم دەگات و دەبێ زوو دروێنە بکرێت ‹جۆی دیوە، کا ناخوا! «مەسەل»› ٢. ☜ **جۆگە ـ١** 🇮🇷 ١. جَو ٢. ☜ **جۆگە ـ١**

◘ **جۆ بەهارە**: جۆرێ جۆ کە بەهاران دەوەشرێت 🇮🇷 جو بهارە

**جۆ ڕووتە**: گیایەکی گەنم‌ئاسایە دەیدوورنەوە بۆ خۆراکی ئاژەڵ 🇮🇷 جو دوسر

**جۆ ڕەش**: جۆرێک جۆ کە دانەکەی مەیلەو ڕەشە 🇮🇷 جو سیاه

**جۆ هەژدان**: جۆرێک جۆی دەنک زلی پاییزکێڵە 🇮🇷 نوعی جو درشت پاییزە

**جۆی هەشتپەڕ**: ☜ **جۆ هەشتدانە**

**جۆ هەشتدانە**: جۆی هەشتپەڕ؛ جۆرێ جۆیە گوڵەکەی چوارسووچە ☰ نوعی جو با خوشەی چهارگوش

• **جۆ**[۲]: پاشەوشە. ـ گەڕ ‹جەفاجۆ؛ بەهانەجۆ› ☰ ـ جو

**جۆبار** / cobar/: ناو. جۆگەی ئاوی زل ☰ جويبار

**جۆبڕ** / cobiř/: ناو. جابڕکە؛ جوبڕک؛ جۆبڕک؛ جۆبڕکە؛ جۆبڕەک؛ جۆبڕە؛ جیّبڕک؛ ڕەگبڕە؛ کوزبڕکە؛ قوزبڕکە؛ قوزگەزک؛ ملە؛ ولە؛ هولە؛ هوولە؛ گیانەوەرێکە لە ژێر زەوی دەژی و ڕەگی گیا دەخوا ☰ آبدُزدک

**جۆبڕک** / cobiřk/: ☜ جۆبڕ

**جۆبڕکە** / cobiřke/: ☜ جۆبڕ

**جۆبڕە** / cob(i)ře/: ☜ جۆبڕ

**جۆبڕەک** / cob(i)řek/: ☜ جۆبڕ

**جۆبە** / cobe/: ناو. ١. *[ناشیرین]* جندەخانە ٢. مەیدانی بەرچاو خستنی خواردەمەنی بۆ فرۆش ☰ ١. فاحشەخانە ٢. میدان فروش کالای خوراکی

**جۆت** / cot/: ناو. ١. جووت؛ جفت؛ کاری کێلانی زەوی ٢. گای زەوی کێلان ☰ ١. شُخم ٢. جُفت؛ گاو شخم‌زنی

**جۆتزک** / cotzik/: ☜ جوتزگ

**جۆتسمە** / cotsime/: ☜ جوتسم

**جۆتک** / cotik/: ناو. ئەو دوو دارەی دەخرێنە سەر کاریتە بۆ بن ئالوودار ☰ دو الوارِ روی شاه تیر سقف

**جۆتکار** / cotkar/: ناو. جووتیار؛ کەسێ زەوی دەکێڵێ ☰ کشتکار

**جۆتکە** / cotke/: ☜ جوتە[۱]ـ١

**جۆتکین** / cotkîn/: چاوگ. لە خۆشیان هەڵپەڕین ☰ شادمانه رقصیدن

**جۆتلێ** / cotlê/: ☜ جوتە[۱]ـ١

**جۆجۆ** / coco/: ☜ جەوجەوین

**جۆحتک** / coĥtik/: ☜ جوتە[۱]ـ١

**جۆخ** / cox/: ناو. فاسونیا؛ پارچەی لە خوری بۆ کەوا و پاتۆڵ ☰ فاستونی

**جۆخین** / coxîn/: ناو. جێخوون: ١. خەرمان؛ بێدەر ٢. خۆیان؛ کلۆشی گێرە کراوی کۆم کراو ٣. *[کینایە]* هەر شتێکی وەک خەرمان لە سەر یەک کۆوە کراو ‹لە هەر چوار کەنارانەوە، لە سۆنگەی خوێنبارانەوە، جۆی خوێن، جۆخینی جەندەکی کوژراوانی گرتبووە بەر خۆی و ڕایدابوو «هەژار، *شەرەفنامە*»› ☰ ١. خرمن گندم ٢. خرمن کوبیده و تودەشده ٣. هر چیز بر هم انباشته

**جۆخینە** / coxîne/: ناو. خەرمانەی مانگ ☰ هالەی ماه

**جۆداس** / codas/: ناو. جۆکێفیلە؛ جۆپێغەمبەرانە؛ جەهداسی؛ جەهداسک؛ جەداسی؛ گیایەکە لە بنەماڵەی قەڵتاس و جۆ هاو چەشنی جۆیە، بەڵام گوڵەکەی ناسکە دەنکەکانی ورد و باریکە، لەوەڕی مالاتە ☰ جو مشک؛ جو صحرایی

**جۆدان** / codan/: ناو. جۆدانە: ١. ددانێکی ئەسپ کە لە پیریدا لووس دەبێ ٢. گۆخڵ؛ برنج‌چنین؛ وەرزێرێ کە برنج دەکێڵێ ٣. تەقەڵی درشت و قیچەڵفاچ؛ جۆرێ تەقەڵە لە کڵاوی دەدەن و بەن لە بەینی تەقەڵەکان هەڵدەکێشن ☰ ١. از دندانهای اسب ٢. شالیکار ٣. نوعی بخیه در کُلاه

**جۆدانە** / codane/: ☜ جۆدان

**جۆر**[۱] / cor/: ناو. جوور؛ چەشن؛ تەرز: ١. تەخلیت؛ کسم؛ لەون؛ تاقمێک کە دانستەی هاوبەشیان هەبێ ‹ئەم جۆرە مرۆڤانە دەبێ چاک بناسی› ٢. چۆنیەتی؛ مارک ‹تکایە لە جۆرە باشەکەی بدە!› ☰ ١و٢. نوع

**جۆر**[۲]: ناوەڵناو. جوور؛ ساز ‹پێکەوە جۆرین› ☰ جور

▣ **جۆر کردن**: جوور کردن؛ ڕێک‌خستن؛ دروست کردن‹کارێکم بۆ جۆر بکە!›. هەروەها: **جۆر بوون** ☰ جور کردن

**جۆراب** / corab/: ☜ گۆرەوی

**جۆرابێن** / corabên/: ناو. جۆراوێن؛ گۆرەوی‌بازی ☰ جوراب‌بازی

**جۆراو** / coraw/: ناو. ١. ☜ **گـۆرەوی** ٢. جـۆرێ کلاشی بـن چـەرم ☰ ١. ☜ **گـۆرەوی** ٢. نـوعی گیوەی کفە چرمی

**جۆراوجـۆر** / corawcor/: ناوەلـناو. جۆربـەجۆر؛ جووروواجوور؛ ڕەنگاوڕەنگ؛ بە چەشن و چۆنیەتی جیا-جیاوە. هەروەها: **جۆراوجۆری** ☰ جوراجور

**جۆراوێن** / corawên/: ☜ **جۆرابێن**

**جۆربەجۆر** / corbecor/: ☜ **جۆراوجۆر**

**جۆربەجۆری** / corbecorî/: ☜ **جۆراوجۆری**

**جۆرکـەر** / corker/: نـاو. پێکهێنـەر؛ دابینکـەر ☰ تهیەکنندە

**جۆری** / corî/: ناو. ڕێکی؛ سازی؛ دۆخی جۆر بوون ‹جۆری جنس› ☰ جوری

**جۆڕ** / cor̄/: نـاو. ١. لوڕ؛ بـن جلێکـی پـووش تـێ ئاخنراوە دەخرێتە سـەر پشـتی بارەبـەر لـە بـن سەرجلەوە ٢. هەگبە؛ خورجێن ٣. پارچەبـەڕەی کۆن ☰ ١. قسـمت انتهـایی پـالان ٢. خـورجین ٣. کُهنەپلاس

**جۆڕک** / cor̄ik/: ناو. ١. جـوار؛ جۆڕکـە؛ جهـورک؛ تووری کا و ئالیـک ٢. هەگبـە؛ خـورجێن ☰ ١. توبرەی علوفە ٢. خُرجین

**جۆڕکە** / cor̄ke/: ☜ **جۆڕک-١**

**جۆڕنـای** / cor̄nay/: چـاوگ. سـەرلێ‌شـێواندن؛ گەوجاندن ☰ سردرگُم کردن

**جۆڕیـان** / cor̄yan/: چاوگ. ١. گۆڕیان؛ گـۆڕان ٢. زمان بە هەڵەدا چوون ☰ ١. تغییر کـردن ٢. تُپُـق زدن

**جۆڕیـای** / cor̄yay/: چـاوگ. سـەرلێ‌شـێوان ☰ سردرگُم شدن

**جۆز** / coz/: ناو. گوێز ☰ گردو

**جـۆزەرد** / cozerd/: نـاو. جـەهزەر؛ هـەڕەتی دروێنەی جۆ ☰ موسم درو جو

**جۆزەردان** / cozerdan/: ناو. ١. سێهەم مانگی ساڵ و ئاخر مانگی بەهار کە ٣١ ڕۆژە ٢. هەڕەتی زەرد بوون و دروێنەی جۆ ☰ ١. خُرداد ٢. موسم درو جو

**جۆش**[١] / coş/: ناو. ١. کوڵ؛ قوڵت ‹بەحرا وجـوودێ جۆش هات/ نوورەک تەنـەززول بـوو ژ زات «مـەلای جزیـری»› ٢. گـڕ؛ تـاو؛ تـین ‹مـن بـەی گشـت مەینەت، بەی گشت دەردەوە/ بەی جـۆش دەروون، ئاه سـەردەوە «مـەحزوون کوردسـتانی»› ٣. شـۆر؛ شور ‹سەر کە جۆشێکی نـەبێ، مـن زرکەتالـەم بـۆ چییە؟/ دل کە هۆشێکی نـەبێ شیشـەی بەتالـم بـۆ چییـە «مـەحوی»› ٤. جەنگـە؛ هـەڕەت؛ گەرماوگەرم ‹ئیسە ناتوانم بـێم، جۆشـی کـارە› ٥. زیپکەی دەم و چاو ‹دەموچاوی پڕ بووە لە جۆش› ٦. پشـکۆژی دار ٧. لـەحیم؛ کـاری پێکـەوە نووسـاندن ٨. جۆشـکاری ٩. پەیوەنـدی ١٠. گووراسن؛ خشتی زۆر برژاوی نێو کوورەخانـە ☰ ١. عمل جوشیدن ٢. حرارت؛ گرمی ٣. هیجان؛ جوش و خـروش ۴. اوج؛ عنفـوان ۵. جـوش صـورت ۶ غُنچەی درخـت ٧. جـوش؛ لحـیم ٨. جوشـکاری ٩. ارتباط ١٠. آجر جوش

⊡ **جۆش خواردن** پێکەوە نووسان ☰ جوش خوردن

**جۆش دان** ١. زۆر بەتین کردنی سۆپە ٢. جۆش کردن ٣. وە کوڵ هێنان ☰ ١. بسیار گرم کردن بخاری ٢. جوش کردن ٣. بە جوش آوردن

**جۆش سەندن** ١. هاتنە کوڵ ‹تەنـدووری دل بـە ئـاگری غـەم جۆشـی سـەندەوە/ بـەزمم دەمێکـە ساردە لە بەر بێ‌سەماوەری! «بێخود»› ٢. *[مەجاز]* گەرم بوونی کۆڕی بـەزم و مووسـیقا ☰ ١. بـە جوش آمدن ٢. گرم شدن مجلس رامشگران

**جۆش هاتن** ☜ **جۆش هاوردن**

**جۆش هاوردن** جۆش هاتن؛ هاتنە جۆش؛ هاتنـە کوڵ ‹دل یەنـد جـۆش ئـاوەرد، وێم جۆشـامەوە/

قرچەی زووخ زام وێم نۆشامەوە «میرزا شەفیعی پاوەیی» ☰ جوش آمدن

**جۆش**[۲]: ئاوەڵناو. قوڵ؛ کوڵ ‹ئاو جۆش› ☰ جوش

**ـ جۆش**[۳]: پاشەوشە. ـ کوڵ ‹شیرجۆش› ☰ ـ جوش

**جۆشامی** / coşamî/: ناو. کاران؛ گیا لەرزانە؛ یەوەدێوێ؛ یەوەڕۆمی ☰ گیاهی است

**جۆشان** / coşan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //جۆشای؛ دەجۆشێ؛ بجۆشێ// جۆشیان؛ جۆشای: ۱. وە کوڵ هاتن؛ هاتنە جۆش ۲. هەڵقوڵین؛ فیچقە کردنی ئاو لە زەوی ☰ ۱. جوشیدن ۲. فَوَران کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: جۆشاو/ چاوگی نەرێنی: نەجۆشان

**جۆشاندن** / coşandin/: چاوگ. تێپەڕ. //جۆشاندت؛ دەجۆشێنی؛ بجۆشێنە// جۆشانن؛ کولاندن؛ کەلاندن ☰ جوشاندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەجۆشاندن

**جۆشانن** / coşanin/: ☜ **جۆشاندن**

**جۆشانە** / coşane/: ناو. دەرمانی لە ناو ئاودا کوڵاو ☰ جوشانده

**جۆشای** / coşay/: ☜ **جۆشان**

**جۆشقان** / coşqan/: ناو. گۆرتێن؛ گۆرتە؛ جۆرێک مێشێن بە هەڵماتی زۆر گەورە ☰ نوعی تیلەبازی با تیلەی بسیار بزرگ

**جۆشکاری** / coşkarî/: ناو. ۱. کاری پێکەوە لکاندنی دوو پارچە کانزا بە داخ کردنیان تا ڕادەیەک کە بتاونەوە و پێکەوە بنووسێن ۲. کارگەی جۆشکاری. هەروەها: **جۆشکار** ☰ ۱. جوشکاری ۲. کارگاه جوشکاری

**جۆشن** / coşin/: ئاوەڵناو. ۱. بەزیپکە؛ خاوەن جۆش ۲. خۆتێهەڵقوڵێن؛ خۆرێکخەر ☰ ۱. دارای جوش ۲. چرب‌زبان

**جۆشنای** / coşnay/: چاوگ. جۆشاندن ☰ جوشاندن

**جۆشەک** / coşek/: ناو. دۆشەک؛ ڕایەخی ناو تێ‌خراوی نەرم ☰ تُشک

**جۆش‌هاتگ** / coşhatig/: ئاوەڵناو. کوڵاو؛ کوڵیاگ ☰ جوشیده

**جۆشیان** / coşyan/: ☜ **جۆشان**

**جۆشیاو** / coşyaw/: ئاوەڵناو. کوڵاو؛ کوڵیاگ؛ کوڵ‌هاتوو ☰ جوشیده

**جۆشیای** / coşyay/: چاوگ. جۆشین ☰ جوشیدن

**جۆشیرە** / coşîre/: ناو. جۆشیلە؛ فەریکەجۆ ☰ جو نرسیده

**جۆشیلە** / coşîle/: ☜ **جۆشیرە**

**جۆشین**[۱] / coşîn/: چاوگ. //جۆشیت؛ دەجۆشی؛ بجۆشە// کولین؛ جۆشان ☰ جوشیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: جۆشیو/ چاوگی نەرێنی: نەجۆشین

**جۆشین**[۲]: ناو. جۆرێ جۆ کە ڕەنگی ئاماڵ‌شینە ☰ نوعی جو مایل به کبود

**جۆشیو** / coşîw/: ئاوەڵناو. ۱. کوڵیو؛ کوڵاو؛ کەلاتی؛ کەلی ۲. فیچقەکردوو ☰ ۱. جوشیده ۲. فَوَران‌کرده

**جۆشێ** / coşê/: ☜ **جۆشێك**

**جۆشێک** / coşêk/: ئاوەڵکار. جۆشێ؛ باش؛ تێر ‹کەی زەماوەن ئەکەی؟ جۆشێک هەڵپەڕین!› ☰ حسابی؛ خوب

**جۆفا** / cofa/: ناو. مەیل؛ واز؛ ئیشتیا؛ مگێز ☰ اشتها

**جۆڤان** / covan/: ناو. بەڵێن؛ پەیمان ☰ پیمان

**جۆقی** / coqî/: ناو. مورشیدی زانا ☰ مُرشد

**جۆک** / cok/: ناو. ۱. ☜ **جۆگە۱** ۲. تیتاڵ؛ تیتاڵی؛ حەنەک؛ پێکەنۆک؛ فشەگاڵتە؛ کوراتا؛ قسە، شیعر، بەتایبەت چیرۆکێ کە بۆ گاڵتە و پێکەنین دەگوترێ ‹بەر لەوە باکۆ بەجێ بێڵم، ئەو جۆکە دەگێڕمەوە ... «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰

۱. ☜ **جۆگە-۱** ۲. جوک

**جۆگا** / coga/: ☜ **جۆگە-۱**

**جۆگمە** / cogme/: ☜ **جومگە**

**جۆگە** / coge/: ناو. ۱. جۆ؛ جۆک؛ جۆگا؛ جۆگەلە؛ جۆلکە؛ جۆلە؛ جوو؛ جوەلە؛ جووە؛ بواریکی باریکی ئاو ‹لە حەسرەت سەروی قەددت چاوی نالی/ دوو جۆگە، بەلکوو دوو ڕووبارە بێ تۆ «نالی»› ۲. هێلەگ؛ موخڵ ⚐ ۱. جوی آب ۲. الک آردبیزی

⊡ **جۆگە داخستن**: ئاو لە جۆگە بەردان ⚐ آب در جوی بستن

**جۆگە هەڵبەستن**: ئاو خستنە جۆگەوە ‹من دوور و تۆ دوور بەینێ ببەستین/ بە فرمێسکی چاو جۆگە هەڵبەستین «فولکلۆر»› ⚐ آب بە جوی انداختن

**جۆگە هەڵکردن**: جۆگە خۆش کردن و ئاو تێخستنی ⚐ جوی ساختن و آب بە آن بستن

**جۆگە هێنان**: جۆگە کێشان بۆ ئاو بردن ‹یا جووت یا جۆگە هێنان/ بۆ ئاو داشتن دەغڵ و دان «قانع»› ⚐ جوی ساختن

**جۆگەت** / coget/: ناو. ڕچە؛ ڕێچکەی نێو بەفر ⚐ راه میان برف

**جۆگەلە** / cogele/: ☜ **جۆگە-۱**

**جۆگەنمی** / cogen(i)mî/: ئاوەڵناو. ماش و برنجی؛ ڕەشی و سپی پێکەوە ⚐ جوگندمی

**جۆل** / col/: ناو. ۱. کەرکە مەڕ؛ کەرپایەز ۲. گیای جاوەڵووکە ⚐ ۱. قسمتی از گلە ۲. علوفەایست

**جۆلانە** / colane/: ناو. جۆللانە: ۱. هەلۆرک؛ لانێک لە گوریس و پەڕۆ ۲. جۆلانێ؛ جۆلانی؛ دارلەکانێ؛ داردێلەکانێ؛ دەیدەک؛ دیلان؛ دەو؛ دەوگە؛ حوزم؛ هەڕەزان؛ هەرازگە؛ هەڵمەقۆ؛ هەمچۆلا؛ قا؛ ئێزی؛ هۆشەکانێ؛ زرنازیق؛ ئامرازێک پێکهاتوو لە دوو گوریس یان زنجیری بە دارەوە کراو و پارچە تەختە یا ئاسنێک پێیانەوە بەسراو بۆ لێنیشتن و ڕاژان ۳. کار و ڕەوتی لەرانەوە و جوولە کردن ‹بەو خوایە بێمەکانە/ دڵم کەوتە جۆلانە «فولکلۆر»› ⚐ ۱. ننو ۲. تاب ۳. نوسان

**جۆلانی** / colanî/: ☜ **جۆلانە-۲**

**جۆلانێ** / colanê/: ناو. ۱. ☜ **جۆلانە-۲** ۲. جۆلانی؛ دیلەکانێ؛ کاری لە گوریسی هەڵخراو نیشتن و ڕاژان ⚐ ۱. ☜ **جۆلانە-۲** ۲. تاببازی

**جۆلک** / colik/: ناو. جووجگ؛ جووجەڵە ⚐ جوجە

**جۆلکە** / colke/: ☜ **جۆگە-۱**

**جۆللانە** / collane/: ☜ **جۆلانە**

**جۆلە** / cole/: ☜ **جۆگە-۱**

**جۆلین** / colîn/: ناو. جاجم؛ مەوج ⚐ جاجیم

**جۆڵا** / coła/: ناو. بووزووتەن؛ جوولگ؛ شاڵباف ‹جۆڵا بە گەز و جانگی خۆی نارازییە «مەسەل»› ⚐ بافندە

**جۆڵاتەنە** / cołatene/: ناو. ۱. داوی جاڵجاڵووکە؛ تالی کاکلەمووشان ۲. ☜ **جاڵجاڵۆکە** ⚐ ۱. تار عنکبوت ۲. ☜ **جاڵجاڵۆکە**

**جۆڵایی** / cołayî/: ناو. شاڵبافی؛ جوولگی؛ کاری بووزووچن ⚐ بافندگی

**جۆڵاییکراو** / cołayîk(i)raw/: ئاوەڵناو. سەردڕ؛ تەنراوە ⚐ منسوج

**جۆڵاییکەرە** / cołayîkere/: ☜ **جاڵجاڵۆکە**

**جۆم** / com/: ناو. ۱. ئاودڕ؛ کەندالێ ئاو دایدڕیوە ۲. دەحل؛ قۆپی؛ قامیشەلان ⚐ ۱. آبکند ۲. نیزار

**جۆماڵ** / comał/: ناو. کاری خاوێن کردنەوەی جۆگە لە قوڕ و لیتە ⚐ لایروبی جوی

**جۆمەرد** / comerd/: ☜ **جوامێر**

**جۆمەڕ** / comeř/: ناو. ئاوەتا؛ جۆگەلەی نێوان تەختە و کەرد ⚐ جوی میان کرتها

**جۆنگ**[1] / cong/: ناو. ۱. *[ئاشیرین]* جووز؛ جوز؛ سووک؛ بز ۲. دۆخی لە جێ چوونی پای وڵاخ ⚐

۱. انگلک ۲. حالت از جا دررفتن پای دام

**جۆنگ**[۲]: ئاوەڵناو. ۱. سـڵ؛ قوشـقی؛ چـەمووش ۲. بێ‌نرخ؛ هیچ و پووچ ⊏ ۱. رموک ۲. بی‌ارزش

**جۆنی** / conî/: ناو. ۱. قوولکە بەرد کە شتی تێـدا دەکوتن ۲. جوون؛ ئاونگی بەردین یان دارین ⊏ ۱. سنگ گود افتاده ۲. هاون چوبی یا سنگی

**جۆین** / coyn/: ☜ **جۆیین**

**جۆیین** / coyîn/: ئاوەڵناو. جـۆین؛ لـە جـۆ ‹دەمـێ خەم بۆ کەوای کۆنە و دەمێ بۆ نانی جۆیینمە/ ئومێد و واسیتەی ژینم گەدایی و مردەشـۆرینمە! «قـانع»› ⊏ جَوین

**جـو**[۱] / cû/: نـاو. ۱. ☜ **جۆگـــە-۱** ۲. جوولەکـە؛ مووسایی ‹سێ ماڵی جوو لەم گەڕەکە دەژیـن› ۳. گیان؛ ژیان ⊏ ۱. ☜ **جۆگە-۱** ۲. یهودی ۳. جان

**جوو**[۲]: ئاوەڵناو. جوولەکە؛ مووسایی؛ سەر بە دیـنـی مووسا ‹میوانەکەم جووە› ⊏ یهودی

**- جـو**[۳]: پاشەوشـە. بەرهـــەمی جـــوون ‹زارجـــوو؛ دەمەجوو› ⊏ ـ خای

**جووت**[۱] / cût/: نـاو. جفت؛ جوفت: ۱. کڵاوی بەڕوو ۲. هاوسەر؛ ژن بۆ شوو یان شـوو بـۆ ژن ‹دەبـوو جووتـی ژیانی هەڵبژێرێ/ نەوەک بابی بە سـەوقاتی بنێرێ! «هێمن»› ۳. جۆت؛ کاری کـێڵانی زەوی بۆ چاندن ٤. یەکەی ژماردنی ئەوەی دوو بە دوو دەڕواتە کار ‹جووتێ کەوش› ⊏ ۱. کُلاهک بلـوط ۲. همسر ۳. شُخم ۴. جُفت

⊡ **جـووت کـردن**: جفــت کــردن؛ زەوی کــێڵان؛ شێوەرد کردن ⊏ شُخم زدن

**جووت گرتن**: نێر دەگەڵ مێوینە یەک گرتن بـۆ پێکەوە ژیان ⊏ همسر گرفتن

**جووت**[۲]: ئاوەڵناو. جفت؛ جوفت: ۱. بەرانبەری تاک ‹مـوژەت قولابییــە هــەم تـیر و هــەم شـیر/ بـرۆت میحرابییـە هـەم تـاق و هـەم جـووت «نـالی»› ۲. پێکەوەلکاو یان لە ڕاستی یـەکتردا ‹وەک گـوێی کــەر جــووتن «مەســەل»› ۳. ســاز؛ نێوانخـــۆش ‹جووت بۆ گاجووتە، نـەک بـۆ سـەگی سـەر رووتـە «مەسەل»› ٤. هاوتا؛ هاوسەنگ ‹نەگبەتی وا بۆتـە جووتم تووشی سەد دەردم ئەکا/ سـەیری کـە چـیم هات بە سەردا موختەسەر ئەیکەم بەیان «بێکـەس»› ⊏ ۱. جفت؛ مُقابـل تـاق ۲. همطـراز ۳. صـمیمی ۴. همتا

⊡ **جووت بون**: جفت بوون: ۱. پێکەوە لکـان یـان لە ڕاستی یەکتردا بـوون ۲. بوونـە هـەواڵ ۳. *[کنایە]* سـەرجێیی کـردن ⊏ ۱. همطرازبـودن/ شدن ۲. با هم ساختن ۳. همخوابگی کردن

**جووت کردن**: جفـت کـردن: ۱. لـە پـەنا یـەک دانانی دوو تای شتێک ‹جووت کردنـی کەوش› ۲. کردنە دوان یان ژمارەیێ کە بە سـەر دوودا دابەش بـێ ⊏ ۱. کنـار هـم نهانـدن دو لنگـەی چیزی ۲. زوج کردن

**جووتانە** / cûtane/: نـاو. باجی ئاغا لـە ڕایـەتی ⊏ مالیات ارباب از کشاورز

**جووتبازن** / cûtbazin/: نـاو. کەلەپچـە ⊏ دسـتبند زندانی

**جووتباقیە** / cûtbaqye/: ناو. جۆرێ دروومـان ⊏ یک نوع دوخت

**جووتبەنـدە** / cûtbende/: نـــاو. ۱. خـــاوەنی ئەسپابی زەوی کێڵان ۲. وەرزێر ‹زەوییێک بسێنە ببە جووتبەندە/ عەبدی خودا بە! نـە عەبـدی بەنـدە «حەقیقی»› ⊏ ۱. مالک وسایل کشاورزی ۲. برزگر

**جووت‌پا** / cûtpa/: ☜ **جفتەپا**

**جووت‌پەروانـە** / cûtperwane/: نـــاو. شـــنۆک؛ جۆرێک هێلی‌کۆپتەر کە لە هـەر دوو سـەرییەوە پەڕەی هەیە ⊏ هلی‌کوپتر شنوک

**جووت‌خاڵ** / cûtxał/: ناو. دووخاڵ؛ نیشانەیەک بەم شـێوە (:) کـە پـێش لـە ڕاڤـەی بابـەت یـان گێڕانەوەی قسەیەک دادەنرێت ⊏ دونقطه (:)

**جووتزگ / cûtzig/**: ناوەڵناو. جۆت‌زک؛ لفەدوانە ☰ دوقلو

**جووتسم / cûtsim/**: ناوەڵناو. جۆت‌سمە؛ دووسمە ☰ جُفت‌سُم

**جووتقۆشە / cûtqoşe/**: ناوەڵناو. جفت‌قۆشە: ١. شاخ‌وەشێن ٢. *[کینایە]* جووت‌مۆر؛ دۆبڕ؛ نەحس و بەدفەڕ ☰ ١. شاخزن (گاو) ٢. شوم

**جووتقۆشەیی / cûtqoşeyî/**: ناو. کەفارەت؛ کەفارە؛ شوومی ☰ بدیُمنی

**جووتکاری / cûtkarî/**: ☜ **جووتیاری**

**جووتکە / cûtke/**: ☜ **جووتە[1]ـ١**

**جووتکەوان / cûtkewan/**: ناو. گیوومە؛ دووکەوان؛ نیشانەیەکی خاڵبەندی بە شێوەی «» ☰ گیومە

**جووتمۆر / cûtmor/**: ☜ **جووتقۆشە ـ٢**

**جووتن / cûtin/**: ☜ **جاوین**

**جووتنەوە / cûtnewe/**: چاوگ. *[کینایە]* درێژدادڕی کردن ☰ ژاژخایی کردن

**جووتوشۆ / cût û şo/**: ناو. کێڵ ☰ کشت و شخم

**جووت و گا / cût û ga/**: ناو. کاری زەوی کێڵان ‹یەکێ تجارەت، یەکێ باخەوان/ یەکێ جووت و گا، یەکێ ئاشەوان «قانع»› ☰ شخم‌زنی

**جووتە[1] / cûte/**: ناو. جفتە: ١. جوحتک؛ جۆتکە؛ جووتکە؛ جۆتلێ؛ جۆحتک؛ جفتێ؛ جفتک؛ جیفڕک؛ لووشک؛ لووشکە؛ لێدانی بە جووتە پێ ٢. تارانی؛ دوو قرانی زێو؛ پوولێکی کۆنی ئێرانی ☰ ١. جُفتک ٢. سکەی نقرەی دو ریالی قدیم

⊡ **جووتە کردن**: شوێن پێ دانانی کەروێشک لە سەر بەفر ☰ رد پا گذاشتن خرگوش بر برف

**جووتە لە ئەستێرە دان**: *[مەجاز]* لەقە لە ئاسمان وەشاندن؛ خۆر بە قوڕ داپۆشین؛ حەول دانی گەوجانەی بێ‌ئاکام ☰ آب در هاون کوبیدن؛ کار ابلهانه و بی نتیجه کردن

**جووتە وەشاندن**: جووتە خستن؛ جفتە خستن؛ لووشک هاویشتن ☰ جُفتک پراندن.

**جووتە[2]**: ناوەڵناو. جفتە: ١. لفەدوانە؛ هەواڵ‌دوانە ٢. هاوتا؛ هاوسەنگ ٣. ڕەگی تەوێڵ زەق (ئەسپ) ☰ ١. دوقلو ٢. همپایە ٣. رگ پیشانی برجستە (اسب)

▣ **جووتەی خێر و شەڕ**: *[پەلار]* دوو هاوڕێ کە هەمیشە پێکەوەن و بێ یەک نایانکرێ ☰ دو همراه جدایی ناپذیر

**جووتەی سەران**: *[کینایە]* دوو هەواڵی هەمیشە پێکەوە ☰ دو دوست جانی

**جووتەی کەو**: ☜ **جووتەی کەوان**

**جووتەی کەوان**: جووتەی کەو؛ دووبرالە؛ دوو ئەستێرەی گەشی جووت لە حەوتەوانەی بچووکدا ☰ فرقدان؛ دو برادران

**جووتەی هەنجیران**: دوو ئەستێرەی لای کلکی برجی دووپشک ☰ دو ستارەی دنبالەی بُرج عقرب

⊡ **جووتە هاویشتن**: جووتە وەشاندن ‹هەندێکی واش هەن چرا وەکوژێنن/ جووتە ئەهاون کاسە ئەڕژێنن «پیرەمێرد»› ☰ جُفتک پراندن

**جووتەوەشێن / cûteweşên/**: ناوەڵناو. جفتەوەشێن؛ لەقەوەشێن ‹ئەو هێسرە شێتەی جووتەوەشێنە/ دایبنێ بۆ من، هیچ دامەمێنە! «قانع»› ☰ لگدپران

**جووتیار / cûtyar/**: ناو. جفتیار؛ جووتێر؛ جوتیار: ١. جۆتکار؛ کەسێ کاری کێڵانی زەمینە ‹جووتیاری تەمەڵ، گای کاوێژ ئەکا «مەسەل»› ٢. وەرزێر؛ فەلا؛ کشیار؛ کەسێ کاری کشت‌وکاڵی زەوی و بە دەست هێنانی داهاتە ‹من جووتیارم، من جووتیارم، من لەگەڵ هەتاو هاوکارم/ من بە ئارەق و ئەو بە تین، دامانڕشتووە بناخەی ژین «هێمن»› ☰ ١. شخم‌زن ٢. برزگر

**جووتیارۆک / cûtyarok/**: ناو. گوڵەعەزرەتی؛ گیایەکە هاوشێوەی گوڵە زافەران، گوڵەکانی

لاسکی نییە، ئەم گیایە سەرەتای بەهار گەڵاپانەکانی دەردێت کە پێی دەڵێن گیا شەلاق و دڵە شێرە، لە ناوەڕاستی گەڵاکانی چەند گوڵی نەپشکوتووی سەوزی هەیە و تا سەرەتای پاییز لە لێو خاک دەمێنێتەوە، سەرەتای پاییز دەپشکوێ و گوڵی سپی و بەنەوش دەرئەکەوێت 🇮🇷 گُل حسرت؛ سورنجان

**جووتیاری** / cûtyarî/: ناو. جووت‌کاری: ۱. کاری زەوی کێڵان ۲. وەرزێری؛ کشتکاری 🇮🇷 ۱. شخم‌زنی ۲. برزگری

**جووتێ** / cûtê/: ناوەڵکار. جووتێک: ۱. بە دوانی؛ دوان ـ دوان؛ بە جووت؛ هەر جووت؛ یەکەی ئەژماردنی هەندێک شتی وەک یەک ‹کاکە! ئەم کەوشانەت جووتێ بە چەند؟› ۲. دوو دانە؛ دوان ‹ئاگری دڵی لە هەر دوو چاوی/ بلێسەی ئەدا وەک جووتێ پشکۆ «دلدار»› 🇮🇷 ۱. یک جُفت ۲. دوتا

**جووتێر** / cûtêr/: ☜ **جووتیار**

**جووجک** / cûcik/: ناو. چێشکە؛ مەلیچک؛ چۆلەکە؛ پاساری 🇮🇷 گُنجشک

**جووجکە** / cûcke/: ☜ **جووچکە**

**جووجوو** / cûcû/: ناو. ساسی؛ سۆنی؛ پند؛ قرنۆ 🇮🇷 ساس

**جووجە** / cûce/: ناو. ۱. جووچک؛ جووجەڵە ۲. *[منداڵانە]* باڵداری پچووک ۳. جووجوو؛ حەمحەم؛ مێروویەکی خوێنمژە، بە جەستەی پانکەڵەی ئاماڵ‌سوور و بۆنی پیسەوە 🇮🇷 ۱. جوجە ۲. پرندەی کوچک ۳. ساس

**جووجەقۆرە** / cûceqore/: ناو. گۆشت فرووجی بە بەرسیلە لێندراو 🇮🇷 آش جوجە با غورە

**جووجەڵە** / cûcełe/: ناو. جووجیلە؛ جووچکی مەل کە تازە دەرهاتووە 🇮🇷 جوجەی پرندگان

**جووجیلە** / cûcîle/: ☜ **جووجەڵە**

**جووچک** / cûçik/: ناو. بێچووی مەل ‹جووچک پەنا ئەباتە بنچک «مەسەل»› 🇮🇷 جوجەی پرندگان

**جووچکە** / cûçke/: ناو. جووچک؛ جووجکە: ۱. کلێجە؛ کەلێژ؛ قلێنچک؛ تەری؛ قەمچک؛ بزدوو؛ سمرە؛ ئێسکەکانی خوارەوەی بڕبڕاگەی پشت کە پێکەوە لکاون و لە مرۆڤدا بریتی لە سێ تا پێنج مۆرەی کورتەوە بووە ۲. بێچووی مەل ۳. دووچکە؛ کلک 🇮🇷 ۱. دُنبالچە ۲. جوجە ۳. دُم

**جووچکەبڕیاگ** / cûçkebiřyag/: ناوەڵناو. ۱. کلک‌قرتاو ۲. *[پلار]* نەرمەبڕ؛ نەرمکێ بن کایێ ۳. *[کنایە]* دوابڕاو؛ لە زار و زێچ بێبەش 🇮🇷 ۱و۲. دُم‌بُریدە ۳. مقطوع‌النسل

**جووچکەسمت** / cûçkesimt/: ناو. نێک؛ خوارتر ئێسکی مۆغەرە 🇮🇷 استخوان دنبالچە

**جووچکەکوڵ** / cûçkekuł/: ناوەڵناو. کوند؛ کلک‌قوڵە 🇮🇷 دُم‌کوتاە

**جووچکەلەقێ** / cûçkeleqê/: ناو. *[پلار]* کلکەفلێ؛ مەرایی و زمان‌لووسی 🇮🇷 تملُّق

**جووحە** / cûĥe/: ناوەڵناو. زانا؛ زۆرزان 🇮🇷 دانا

**جوودار** / cûdar/: ناوەڵناو. گیاندار؛ زیندوو 🇮🇷 جاندار

**جوور**[1] / cûr/: ☜ **جۆر**

⊡ **جوور کردن**: ☜ **جۆر کردن**

**جوور**[2]: ئامراز. وەک؛ وەکوو؛ چەشنی ‹باقر خان لە ژێر بیس نەفەر لە بان/ من لە ناوەڕاس جوور کەواو لای نان! «شامی کرماشانی»› 🇮🇷 مانندِ؛ مثلِ

**جووراجوور** / cûrwacur/: ☜ **جۆراوجۆر**

**جووڕ** / cûř/: ↓

⊡ **جووڕ کردن**: *[پلار]* خش کردن و تاوانی قومار بە حەریف دان 🇮🇷 اخ کردن

**جووڕنای** / cûřnay/: ☜ **چۆڕاندن**

**جووز**[1] / cûz/: ناو. *[ناشیرین]* بز؛ کاری پەنجە بە قنگەوە کردن 🇮🇷 انگُلک

⊡ **جووز پێوەکردن**: *[ناشیرین]* جووک پێوەکردن؛ پەنجە بو قنگ بردن 🇮🇷 انگلک کردن

**جووز**[٢]: دەنگەناو. گیز؛ دەنگی وەک سەماوەر یان مێش ⇐ وِز؛ صدای مانند سماور یا مگس

**جووزان** / cûzan/: ناو. گوێزان؛ مووس؛ تیخی موو تاشین ⇐ تیغ

**جووزاندن** / cûzandin/: چاوگ. [پەلار] جووزانن؛ جویزنای؛ جووزەجووز کردن ⇐ وِز- وِز کردن

**جووزانن** / cûzanin/: ☜ **جووزاندن**

**جووزن** / cûzin/: ئاوەڵناو. [پەلار] جووزەجووزکەر؛ نووکن ⇐ وزوزو

**جووزنای** / cûznay/: چاوگ. [پەلار] جووزەجووز کردن ⇐ وِز- وِز کردن

**جووزە** / cûze/: دەنگەناو. [پەلار] دەنگی زۆر باریک ⇐ وِز- وِز

**جووزەجووز** / cûzecûz/: ناو. ١. جووزەی لە پەستا ٢. [پەلار] کاری جووزاندن ⇐ ١. وِز - وِز پیاپی ٢. وِز - وِز کردن

⊡ **جووزەجووز کردن:** [پەلار] جووزاندن؛ نووکانن ⇐ وِز - وِز کردن

**جووزەجووزکەر** / cûzecûzker/: ئاوەڵناو. جووزن؛ نووکن ⇐ وزوزو

**جووزەرە** / cûzere/: ناو. خونچە؛ غونچە؛ گۆچک ⇐ غنچە

**جووزەڵە** / cûzełe/: ناو. تووزەڵە؛ چووزەڵە ⇐ سازی بادی شبیە نی

**جووقاندن** / cûqandin/: چاوگ. تێنەپەڕ. //جووقاندت؛ دەجووقێنی؛ بجووقێنە// [پەلار] دەنگ و هەرا کردن ⇐ سروصدا راە انداختن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەجووقاندن

**جووقن** / cûqin/: ئاوەڵناو. [پەلار] جیقن؛ لاوازی بێ‌هێز ⇐ مُردنی

**جووقنای** / cûqnay/: چاوگ. ١. [پەلار] جووقاندن ٢. [ناشیرین] فیراندن ⇐ ١. سروصدا راە انداختن ٢. ریدن

**جووقە** / cûqe/: ناو. [پەلار] دەنگ و بزاو؛ هەست و خوست ⇐ سروصدا

**جووقەوار** / cûqewar/: ئاوەڵناو. [پەلار] خاوەن گیان و بەهەست ⇐ جاندار

⊡ **جووقەوار لێ بڕین:** [پەلار] هەموو کوشتن و کەس نەهێشتن ⇐ قتل عام کردن

**جووک**[١] / cûk/: ناو. ١. [ناشیرین] سووک؛ جووز؛ کاری کلک بو قنگ بردن ٢. جۆگەی پچووک ٣. چۆلەکە؛ مەلیچک ⇐ ١. انگلک ٢. جوی کوچک ٣. گنجشک

⊡ **جووک پێوەکردن:** ☜ **جووز پێوەکردن**

**جووک**[٢]: دەنگەناو. دەنگی بەچکە مەل ⇐ صدای جوجە

**جووکان** / cûkan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //جووکای؛ دەجووکێی؛ بجووکێ// جووکاندن؛ جووکانن؛ دەنگ لێوە هاتنی بەچکە مەل ⇐ جیک‌جیک کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەجووکان

**جووکاندن** / cûkandin/: ☜ **جووکان**

**جووکانن** / cûkanin/: ☜ **جووکان**

**جووکن** / cûkin/: ئاوەڵناو. [پەلار] نووزەنووزکەر؛ گرینۆک و داواکەر (منداڵ) ⇐ وِزوِزو

**جووکنای** / cûknay/: چاوگ. جووکەجووک کردن؛ جووکاندن ⇐ جیک‌جیک کردن

**جووکە** / cûke/: دەنگەناو. ١. [پەلار] نووزە؛ دەنگی باریک ‹هەزار جار بڵێن: کوا مەڕنەمووکە؟/ بێدەنگ! قڕوقپ! لێت نەیە جووکە! «هەژار، بۆ کوردستان»› ٢. دەنگی بێچووی باڵدار ‹وە جووکە و جریوەی مەلی بن پاسار وە خەبەر هاتم› ⇐ ١. جیک ٢. جیک‌جیک

**جووکەجووک** / cûkecûk/: دەنگەناو. [پەلار] جریک و جاک؛ دەنگی زۆری باریک ⇐ جیک - جیک پیاپی

**جوکەنە** / cûkene/: ناو. [پلار] گیانەڵاو؛ دۆخی گیان دان ☰ حال نَزع

**جوکی**[1] / cûkî/: ناو. مورتاز ☰ مُرتاض

**جوکی**[2]: ئاوەڵناو. [پلار] ١. جووکن؛ نووکەنووککەر ٢. فیسقەڵ؛ ترسەنۆک ☰ ١. نق‌نقو ٢. ترسو

**جوکیای** / cûkyay/: چاوگ. [پلار] جووکان ☰ جیک‌جیک کردن

**جولان** / cûlan/: ☜ **جوڵان**

**جولاندن** / cûlandin/: ☜ **جوڵاندن**

**جولانن** / cûlanin/: ☜ **جوڵاندن**

**جولای** / cûlay/: ناو. ژوویە؛ تەمووز؛ مانگی حەوتەمی ساڵی زایینی، ٣١ ڕۆژە و لە ١٠ی پووشپەڕەوە دەسپێدەکات و لە ٩ی گەلاوێژدا تەواو دەبێ ☰ جولای؛ ژوئیە

**جولبر** / cûlbiř/: ناو. قرژانگ؛ قرژاڵ ☰ خرچنگ

**جولجال** / cûlcal/: ☜ **جمشت**

**جولگ** / cûlig/: ☜ **جۆلا**

**جولگی** / cûligî/: ☜ **جۆلایی**

**جولە** / cûle/: ناو. ١. ☜ **جوڵە** ٢. جوو؛ مووسایی ☰ ١. ☜ **جوڵە** ٢. یهودی

**جولەکە** / cûleke/: ناو/ ئاوەڵناو. جوو؛ مووسایی ☰ یهودی

**جوڵ** / cûł/: ناو. بزاو؛ لەپت ☰ حرکت

**جوڵان** / cûłan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //جووڵای؛ دەجووڵێی؛ بجووڵێ// جووڵان؛ جووڵیان؛ جووڵین؛ بزووتن؛ تەکان خواردن ‹هەتاکوو هێزی ئەم خەڵکە نەجووڵێ/ هەزار پاڕانەوەت دایە، بە پووڵێ «هێمن»› ☰ جنبیدن؛ تکان خوردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: جووڵاو/ چاوگی نەرێنی: نەجووڵان

**جوڵاندن** / cûłandin/: چاوگ. تێپەڕ. //جووڵاندت؛ دەجووڵێنی؛ بجووڵێنە// جووڵاندن؛ جووڵانن؛ جووڵاندنەوە؛ جیاندن؛ بزاوتن؛ بزواندن؛ تەکان پێدان ‹بجووڵێنێ سەبا تا سەرو و شمشادی چەمەن بێخود!/ سەلاوەت بێ لە قەدد و قامەتی ڕەعنایی پێغەمبەر «بێخود»› ☰ جُنباندن؛ تکان دادن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەجووڵاندن

**جوڵاندنەوە** / cûłand(i)newe/: ☜ **جوڵاندن**

**جوڵانەوە** / cûłanewe/: چاوگ. بزووتن؛ جووڵان ☰ جُنبیدن

**جوڵاو** / cûław/: ئاوەڵناو. بزووتوو؛ بزاوتوو؛ تەکان‌پێدراو ☰ جُنبیده

**جوڵنای** / cûłnay/: چاوگ. جووڵاندن ☰ جُنباندن

**جوڵە** / cûłe/: ناو. جووڵە؛ ژووڵە؛ تەکان ☰ جُنبش؛ حرکت

⊡ **جوڵە کردن**: بزووتن؛ تەکان خواردن ☰ جُنبیدن؛ تکان خوردن

**لە جوڵە خستن**: تەکان بڕین؛ داتەمراندن ☰ از حرکت انداختن

**جوڵەجوڵ** / cûłecûł/: ناو. جمەوجووڵ ‹وەک دێوی لەعنەتی کە کەلامی قەدیمی بیست/ زاهید کە باسی عیشق ئەبیێ، دێتە جووڵەجووڵ «مەحوی»› ☰ تکان

**جوڵەر** / cûłer/: ☜ **جوڵێنە**

**جوڵەوەر** / cûłewer/: ناو. ١. ئەوەی بجووڵێ ٢. مێروو؛ جانەوەری ورد ☰ ١. شیئ متحرک ٢. حشره

**جوڵیان** / cûłyan/: ☜ **جوڵان**

**جوڵیایۆ** / cûłyayo/: چاوگ. جووڵانەوە ☰ جُنبیدن

**جوڵین** / cûłîn/: ☜ **جوڵان**

**جوڵێنە** / cûłêne/: ئاوەڵناو. بزۆک؛ جووڵەر؛ بزۆز؛ بزێو؛ بەتایبەتمەندی جووڵانەوە ☰ مُتحرک

**جووم** / cûm/: ناو. ١. جام؛ تاس؛ زەرک؛ قاپی مس ٢. جمۆجووڵ؛ کار و ڕەوتی بزووتن ٣. تیرە؛ دەسە؛ دەستە ≡ ١. طاس ٢. جم؛ تکان ٣. دستە

**جوومار** / cûmar/: ناو. کەوەمار؛ جۆرێ ماری شینی کوڵە ≡ نوعی مار

**جوومە** / cûme/: ناو. کراس؛ گوملک؛ گجی ≡ پیراهن

**جوومەکار** / cûmekar/: ناو. جوومەکڤان؛ کەسێ کە ڕایەخ و بەڕە دروست دەکا ≡ گلیم‌باف

**جوومەکڤان** / cûmekvan/: ☜ **جوومەکار**

**جوون**[1] / cûn/: ☜ **جاوین**

**جوون**[2]: ناو. ١. ☜ **جنێو** ٢. ئاونگی بەردین و داریـن ٣. دەس ئاونگ؛ دەسەوان ≡ ١. ☜ **جنێو** ٢. هاون سنگی ٣. دستەی هاون

**جوونات** / cûnat/: ناو. سپێ؛ ئەسپێ ≡ شپش

**جوونجک** / cûncik/: ناو. چۆلەکە؛ چوێلەکە؛ مەلیچک؛ پاساری ≡ گنجشک

**جوونچک** / cûnçik/: ناو. چۆلەکە ≡ گُنجشک

**جوونگ** / cûng/: ناو. قار؛ نقار؛ خاک ≡ قهر

**جوونەوە** / cûnewe/: چاوگ. ١. دیسان جاوین ٢. *[کینایە، پلار]* زۆر گوتنەوەی قسەیەک ≡ ١. جویدن دوبارە ٢. ژاژخایی کردن

**جووە** / cûwe/: ناو. ١. جوومە؛ کراس؛ گوملک ٢. ☜ **جۆگە-١** ≡ ١. پیراهن ٢. ☜ **جۆگە-١**

**جووی** / cûy/: ناوەڵناو. لفەدوانە؛ دوانە؛ جمک ≡ دوقلو

**جووین** / cuwîn/: چاوگ. جاوین؛ ژاوای ≡ جویدن

**جە**[1] / ce/: ☜ **جۆ**[1]-٢

**جە**[2]: ئامراز. لە؛ ل؛ ژ ‹جە مەی و جە زەهر پیالە پوڕ کەرد/ یەکێ جە شەراب سافتەر جە دوڕ کەرد «خانای قوبادی»› ≡ از

**جەب** / ceb/: ناو. جەبە؛ کار و ڕەوتی بووردن؛ بەخشین لە خەتا و تاوان ≡ عفو

⊡ **جەب دان**: لێ‌بووردن؛ چاوپۆشین؛ عافوو کردن ≡ چشم‌پوشی کردن

**جەباری** / cebarî/: ناو. کەتیرە؛ شیلەی زەردەگوێنی ≡ کتیرا

**جەبر** / cebr/: ناو. ١. زۆر؛ خورتی ٢. لقێکی گەورەی زانستی بیرکاری ٣. ئامۆژەیێ کە دەڵێ مرۆڤ لەو کارانە کە دەیکا ناچارە و لە خۆیەوە هیچ دەسەڵاتێکی نییە ≡ ١. زور ٢و٣. جبر

**جەبرا** / cebra/: ناوەڵناو. چەپلەر ≡ چپ‌دست

**جەبری**[1] / cebrî/: ناوەڵناو. ١. زۆری؛ زۆرەکی؛ بخورتی ٢. بڕوامەند بە جەبر ≡ ١. زورکی؛ اجباری ٢. جبرگرا

**جەبری**[2]: ناوەڵکار. ١. بە زۆر؛ زۆرەکی؛ بخورتی ٢. ناچار؛ بە ناچاری ≡ ١. زورکی؛ اجباری ٢. ناچاری

**جەبل** / cebil/: ناو. ئاوان ≡ هاون

**جەبلە**[1] / ceble/: ☜ **جەبڵ**

**جەبلە**[2]: ناوەڵناو. زل و ئەستوور؛ مەزن و ستوور ≡ بزرگ و ستبر

**جەبڵ** / cebł/: ناو. جەبلە؛ پێخوێی قوڕ؛ پاخوای قوڕ؛ قوڕی بە سەر یەکدا کراو ≡ تودەی گِل

**جەبۆ** / cebo/: جێناو. فلان؛ کاورا؛ کابرا؛ ئەوەکە ≡ یارو

**جەبوون** / cebûn/: ناوەڵناو. ١. ڕژد؛ چرووک ٢. کەلەزات؛ ترسەنۆک ≡ ١. خسیس ٢. ترسو

**جەبە**[1] / cebe/: ☜ **جەب**

**جەبە**[2]: ناوەڵناو. ١. سڵ؛ قوشقی؛ بەیدەس ٢. یاغی؛ سەربزێو ٣. جیاواز؛ جیاکار؛ تایبەتی ≡ ١. رموک ٢. یاغی ٣. استثنایی

**جەبەر** / ceber/: ناو. لا؛ بەر ≡ طرف؛ سو

**جەبەرە** / cebere/: ناو. جەوەرە؛ سەرمای زۆر؛ سەرمای سەخت 🇮🇷 سرمای سخت

⊡ **جەبەرە نواندن:** خۆ لە ئاوا کردنی چۆلەکە کە نیشانەی هاتنی سەرمای توندە 🇮🇷 در آب شدن گنجشک که نشانەی آمدن سرمای سخت است

**جەبەژ** / cebej/: ☜ جەبەش

**جەبەش** / cebeş/: ناو. زەبەش؛ جەبەژ؛ هەنی؛ شفتی؛ شامی؛ شووتی 🇮🇷 هندوانه

**جەبەڵخانە** / cebełxane/: ☜ جبەخانە

**جەبیلخانە** / cebîlxane/: ☜ جبەخانە

**جەتان** / cetan/: ئاوەڵناو. ڕەقەن؛ کڕاڵ؛ بوورە (زەوی) 🇮🇷 سفت و سخت (زمین)

**جەترەقە** / cetreqe/: ناو. جۆرێ کولێرەی سەر ساج 🇮🇷 نوعی گردەی ساجی

**جەجاڵ** / cecał/: ☜ ججاڵ

**جەحانم** / ceĥanim/: ☜ جەهەندەم

**جەحر** / ceĥr/: ناو. ژەهر؛ زەهر؛ ژەحر؛ ژەقنەمووت 🇮🇷 زهر؛ سم

**جەحش** / ceĥş/: ☜ جاش[1]ـ۱

**جەحشک** / ceĥşik/: ☜ جاش[1]ـ۱

**جەحفەری** / ceĥferî/: ناو. ۱. جۆرێ پۆلا کە شیری لێ دروست دەکەن ۲. ☜ جافری 🇮🇷 ۱. پولادی که از آن شمشیر سازند ۲. ☜ جافری

**جەحنی** / ceĥnî/: ئاوەڵناو. توورە؛ زیز؛ ڕق‌هەستاو 🇮🇷 عصبانی؛ جوشی

**جەحنین** / ceĥnîn/: چاوگ. ڕک بوونەوە؛ توورە بوون؛ ڕق هەستان 🇮🇷 عصبانی شدن

**جەحەندەم** / ceĥendem/: ☜ جەهەندەم

**جەحەنم** / ceĥenim/: ☜ جەهەندەم

**جەحەنەم** / ceĥenem/: ☜ جەهەندەم

**جەحێڵ** / ceĥêł/: ئاوەڵناو. جاعێر؛ جحێڵ؛ جاهاڵ؛ جاهێڵ؛ جەهێڵ؛ جاڵ؛ جێڵ؛ گەنج؛ لاو؛ جوان؛ پێگەیشتوو 🇮🇷 جوان

**جەخار** / cexar/: ناو. ۱. جخار؛ کەسەر؛ مەینەت؛ خەم؛ خەفەت؛ کوڵ ‹دەمەی هەناسەی گەرمی نارەکەم/ نە کوورەی دەروون پڕ جەخارەکەم «مەولەوی»› ۲. داخ؛ مخابن ۳. شەتیر؛ ساتۆرک؛ ساتوور 🇮🇷 ۱. غم؛ اندوە ۲. افسوس ۳. ساطور

**جەخت** / cext/: ناو. ۱. پەلە؛ لەز ۲. چۆنیەتی باش هێنان؛ بۆ هاتن ۳. دووهەمین پژمە ٤. کوت؛ پێداگری 🇮🇷 ۱. شتاب ۲. مبارکی؛ یُمن ۳. جَخت ۴. تأکید

⊡ **جەخت کردن:** پێ داگرتن 🇮🇷 تأکید کردن

**جەخت هێنان:** دوو جار پژمین 🇮🇷 جَخت آوردن

**جەختی** / cextî/: ناو. چالاکی؛ مەزبووتی؛ گورج و گۆڵی 🇮🇷 چستی؛ چالاکی

**جەخز** / cexz/: ☜ جەغز

**جەخسی** / cexsî/: ناو. شیلانگەری؛ چەکسازی 🇮🇷 اسلحەسازی

**جەخیز** / cexîz/: ☜ جەغز

**جەد** / ced/: ناو. جەدد؛ باوەگەورە 🇮🇷 نیا

**جەداسی** / cedasî/: ناو. گیایەکە 🇮🇷 گیاهی است

**جەداوجەد** / cedawced/: ناو. زادپەیزاد؛ پشتاوپشت 🇮🇷 جاندرجد

**جەدد** / cedd/: ☜ جەد

**جەدرقە** / cedirqe/: ناو. جۆرێ نانی تەنووری، ناسکتر و پانتر لە کولێرە 🇮🇷 نوعی نان، شبیه تافتون

**جەدماد** / cedmad/: ئاوەڵناو. زوورەس؛ بە تایبەتمەندی زوو پێگەیین 🇮🇷 زودرس

**جەد و بنجەد** / ced û binced/: ناو. جەد و ئابا؛ بنە و بنەچەک 🇮🇷 جد اندر جد

**جەدەو** / cedew/: ☜ جدەو

**جەر** / cer/: ☜ جەهر

**جەرا** / cera/: ئاوەڵناو. ڕزگار؛ خەلاس ≡ خلاص
⊡ **جەرا بون**: بێچوو هێنـانی بـە دژواری ≡ بـە دشواری زاییدن
**جەرباندن** / cerbandin/: ☜ **جەڕباندن**
**جەربەزە**[1] / cerbeze/: نـاو. ١. جەزرەبە؛ ئـازار ٢. غیرەت؛ ئازایـەتی ≡ ١. شـکنجە؛ آزار ٢. غیـرت؛ جُربُزە
**جەربەزە**[2]: ئاوەڵـناو. هاروهـاج؛ بـزۆز؛ هەدانـەدەر؛ دانەسەکناو. هەروەها: **جەربەزەیی** ≡ بازیگوش
**جەربی** / cerbî/: ☜ **جەڕبی**
**جەرجـو** / cercû/: نـاو. قـاپوڕەی فیشـەک ≡ پوکەی فشنگ
**جەرجهە** / cerc(i)he/: ئاوەڵـناو. لێزان؛ شـارەزا ≡ ماهر
**جەرخەتـو** / cerxetû/: نـاو. جەرخـەتوون؛ ئاوگەردان؛ ئاوگەردێن؛ چەرخی دەسکدار بۆ ئاو هەڵێنجان ≡ چرخِ چاه
**جەرخەتون** / cerxetûn/: ☜ **جەرخەتو**
**جەرد** / cerd/: ناو. ١. داکۆکی؛ کۆشـش؛ حـەوڵ ٢. مشکەکوێرە ≡ ١. جهد ٢. موش‌کور
**جەردام** / cerdam/: نـاو. گۆلاو؛ چاڵۆکەی پـڕ لـە ئاو ≡ چالەی پُر آب
**جەردە** / cerde/: نـاو. ١. چەتـە؛ ڕێگـر؛ گـۆران ‹کەچی هەر خۆمـان ئـەبین بـە جـەردە/ چەتـەیی ئەکەین لەم کێو و هـەردە «مـوفتی پێنجـوێنی»›. هەروەها: **جەردەیی** ٢. جرج؛ مشک ≡ ١. راهزن ٢. موش
**جەردی** / cerdî/: ئاوەڵـناو. سوور لە سەر کاری خۆ ≡ جدّی
**جەرسە** / cerse/: ☜ **جەلسە**
**جەرسی** / cersî/: ناو. ڕیسـوایی؛ بـێ‌ئابـڕوویی ≡ رسوایی
**جەرقین** / cerqîn/: چـاوگ. تـەق‌وپـۆق کـردن؛ تەقەتەق کردن ≡ تَق‌وتوق کردن
**جەرگ** / cerg/: نـاو. جگـەر؛ جـەڕیی؛ جەگـەر: ١. کەزەب ‹جـەرگم سـووراخە چـوو لانـەی زەنبـوور/ بـەس کـە شـنەفتم قسـەی جووراجـوور «شـامی کرماشانی»› ٢. *[مەجاز]* منداڵ؛ ڕۆڵە ≡ ١. جگر ٢. فرزند
⊡ **جەرگ سوتان**: *[مەجاز]* جگەر سـووتان؛ منـداڵ مردن ≡ فرزند مُردن
**کزەی جەرگ هاتن**: دڵ سووتان؛ بەزەیی هاتنەوە ≡ دل سوختن
**جـەرگاوس** / cergawis/: ئاوەڵـناو. مەینـەتبار؛ دڵپڕلەخەم ≡ اندوهگین
⊡ **جەرگاوس بون**: *[مەجاز]* دڵ پـڕ لـە داخ بـوون. هەروەها: **جەرگاوس کردن** ≡ اندوهگین بودن
**جـەرگبڕ** / cergbiř/: ئاوەڵـناو. *[مەجاز]* دڵـچڕێن؛ دڵـتەزێن؛ هـۆی ئـازراوی و کەسـەری زۆر ≡ جگرخراش
**جـەرگبڕاو** / cergb(i)řaw/: ئاوەڵـناو. جـەرگاوس؛ مەینەتبار؛ دڵ پڕ لە خەم ‹تا پێکەوە بوون هـەموو تـەواو بـوون/ لێـک دا کـە بـڕان، جەرگبـڕاو بـوون «سەیفولقوزات»› ≡ جگرخراش
**جەرگخۆرە** / cergxore/: ناو. خەمی گەورە؛ کـوڵ و کەسەری مەزن ≡ اندوه بزرگ
**جـەرگدڕاو** / cer(i)gd(i)řaw/: ئاوەڵـناو. کونەجەرگ؛ زووخ‌پێدراو ≡ زجرکشیده
**جەرگسوتاو** / cergsûtaw/: ☜ **جگەرسوتاو**
**جەرگقایم** / cergqayim/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ١. ئازا؛ ڕەشید؛ بەجەرگ ٢. بە سەبر و حەوسەڵـە ≡ ١. جگردار ٢. شکیبا
**جەرگوناو** / cerg û naw/: ناو. هـەناو؛ ئەنـدامانی ناو زک ≡ اَحشا
**جەرگە** / cerge/: نـاو. ١. ناوەڕاسـت؛ دوڕ ‹ئـەی ڕەفیقـان، ئـەی عـەزیزانی ولات!/ ئـەی بـرای

هاوسەنگەری جەرگەی خەبات! «هێمن»› ٢. هەڕەت؛ جەنگە ٣. دەستە؛ تاقم ‹لە مۆسکۆ مەکۆی ڕزگاران/ لە ناو جەرگەی دۆست و یاران «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ≣ ١. وسط ٢. موسم ٣. گروه

**جەرگەبەز** / cergebez/: ناو. ١. ڕەشبەڵەک؛ هەڵپەڕکێ ژن و پیاو تێکەڵ ٢. جەرگی لە ناو چەوریدا سووروە بوو ≣ ١. رقص گروهی زن و مرد ٢. جگر سرخ شده

**جەرگەگڕە** / cergeg(i)ře/: ناو. ڕەوتی هەو کردنی جەرگ ≣ التهاب جگر

**جەرگهەڵێن** / cerghełên/: ئاوەڵناو. سووسڕەت؛ سەیر و سەمەرە ≣ عجیب

**جەرمە** / cerme/: ناو. ١. میوەی نیوە وشک ٢. فەریکەی دانەوێڵە ≣ ١. میوەی نیم‌خشک ٢. دُلمُل

**جەروو** / cerû/: ئاوەڵناو. بیانووگر؛ بەهانەگیر ≣ بهانه‌جو؛ بهانه‌گیر

**جەرەتاو** / ceretaw/: ناو. پاشاو؛ ئاوێ کە لە وەختی ئاودێریدا لە زەوی دەردەچێ ‹سەدان چاڵووی پڕ لە جەرەتاو ئەمسەر بۆ ئەوسەری ڕێگایان داپۆشیبوو› ≣ آب هَدَر رفته از آبیاری

**جەری** / cerî/: ☜ **جەرگ**

**جەریدە** / cerîde/: ناو. ڕۆژنامە ≣ جریده

**جەریفک** / cerîfik/: ☜ **جاڕو-١**

**جەریمە** / cerîme/: ناو. تاوان؛ ماڵێ کە لە خەتابار دەسێنرێ ≣ جریمه

**جەریمەبژێر** / cerîmeb(i)jêr/: ناو. تاواندەر؛ بژێرەوەی زیان ≣ غرامت‌پرداز

**جەریمەکراو** / cerîmek(i)raw/: ئاوەڵناو. جەریمەلەسەر؛ تاوانبار؛ ئەوی دەبێ قەرەبوو بکاتەوە ≣ جریمه شده

**جەریمەلەسەر** / cerîmeleser/: ☜ **جەریمەکراو**

**جەریە** / cerye/: ناو. گیرەی چەرم تا دەیدروون ≣ پرس چرم‌دوزی

**جەڕ** / ceř/: ناو. ١. گۆزەی گڵینی مل‌باریک ٢. کاری توند کێشان و شەتەک دان ٣. پێچ و بورغی، ئامرازی گووشینی کتێب و ... ٤. پێچ ≣ ١. نوعی سبو ٢. عمل محکم کشیدن و سفت بستن ٣. منگنه ۴. پیچ

▣ **جەڕ لە دەم**: *(کینایە)* تازە و دەستلێنەدراو ≣ دست‌نخورده

▣ **جەڕ دان**: ١. جەڕاندن؛ پێچاندن ٢. توند کێشان و شەتەک دان ≣ ١. پیچ دادن ٢. مُحکم کشیدن و سِفت کردن

**جەڕاح** / ceřaĥ/: ☜ **جەڕڕاح**

**جەڕاحی** / ceřaĥî/: ☜ **جەڕڕاحی**

**جەڕان** / ceřan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //جەڕای؛ دەجەڕێ؛ بجەڕێ// پێچران و تێ‌گیران بە توندی ‹نزیکی ساڵ و نیوێکی تەواوە/ بە زنجیری جەفا قاچم جەڕاوە «موفتی پێنجوێنی»› ≣ بە سختی گیر کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: جەڕاو/ چاوگی نەرێنی: نەجەڕان

**جەڕاندن** / ceřandin/: چاوگ. تێپەڕ. //جەڕاندت؛ دەجەڕێنی؛ بجەڕێنە// جەڕانن؛ توند پێچان؛ بە توندی پێچ دان ‹قانوونی ئێستە باڵی فەلاحی جەڕاندووە/ گەر نادیاری بۆ بەگ و میر مەرگ و سەم بووە «قانع»› ≣ محکم پیچ دادن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەجەڕاندن

**جەڕانن** / ceřanin/: ☜ **جەڕاندن**

**جەڕب** / ceřb/: ناو. ئەزموون؛ تاقی ≣ تجربه

**جەڕبادەر** / ceřbader/: ناو. پێچکوشتی؛ پێچ‌بادەر؛ بورغی‌کەرەوە؛ دەرنەفیس؛ هاچەری بادانی پێچ ≣ پیچ‌گوشتی

**جەڕباندن** / ceřbandin/: چاوگ. جەربانن؛ تاقی کردنەوە ≣ آزمودن

**جەڕبی / ceřbî/**: ناوەڵناو. جەربی؛ ئەزموودە؛ تاقیەوەکراو ☰ آزموده

**جەڕبین / cerbîn/**: چاوگ. ئەزموون؛ تاقی کردنەوە ☰ تجربه کردن

**جەڕجەڕ / cerceř/**: ناو. ١. جەنجەڕ؛ ئامرازی کلۆش ورد کردن لە دار و ئاسن ٢. چەرخی ئاو هەڵکێشان لە بیر ☰ ١. خرمنکوب ٢. دولاب

**جەڕجەڕئاژۆ / cerceř'ajo/**: ☜ **جەڕجەڕڤان**

**جەڕجەڕڤان / cerceřvan/**: ناو. جەرجەڕئاژۆ؛ کەسێ کە بە جەنجەڕ گێرە دەکا ☰ رانندەی خرمنکوب

**جەڕڕاح / ceřřaĥ/**: ناو. جەڕاح: ١. برینگەر؛ برینکار؛ نەشتەرکار؛ نشدار ٢. شکستەبەند؛ هەڵبەست؛ ئێسک‌گرەوە ☰ ١. جرّاح ٢. شکستەبند

**جەڕڕاحی / ceřřaĥî/**: ناو. جەڕاحی؛ شکستەبەندی ☰ شکستەبندی

**جەڕڕە / ceřře/**: ناو. جەڕە؛ گۆزەی مل‌باریک ☰ نوعی سبوی گلین

**جەڕمەجووڕی / ceřmecûřî/**: ناو. دەمەقاڵە؛ شەڕەقسە ☰ جدال لفظی

**جەڕنای / ceřnay/**: چاوگ. جەڕ دان؛ جەڕاندن ☰ پیچاندن؛ پیچ دادن

**جەڕنە / ceřne/**: ناو. مەڕی شاخدار ☰ میش شاخدار

**جەڕومەنگەنە / ceř û mengene/**: ناو. گیرە؛ ئامرازی توند گرتنی کتێب بۆ بەرگ تێ‌گرتن ☰ منگنەی کتاب

**جەڕۆکە / ceřoke/**: ناو. جەڕەی بچکۆلانە ☰ سبو

**جەڕە / ceře/**: ناو. ١. جەڕڕە؛ گۆزەی مل‌باریک ٢. چەپکە؛ دەستە ‹جەڕە چێو› ٣. جەڵە؛ جەم؛ کۆڕ؛ تاقمێ لە خەڵک ‹جەڕە ئایەم› ☰ ١. کوزه ٢. دسته (چوبی) ٣. گروهی از مردم

**جەڕەبابە / cerebabe/**: ناو. کاری شەداندن؛ شەتەک دان؛ توند پێچان ☰ عمل مُحکم پیچیدن

**جەڕەزەلام / cerezelam/**: ناو. گاوشە؛ دەفری زل لە سواڵەت بۆ ئاو تێ‌کردن ☰ سبوی بزرگ

**جەڕیسەقیل / ceřîseqîl/**: ناو. گرانکێش ☰ جرثقیل

**جەڕیفک / ceřîfik/**: ناو. گسک؛ گزک؛ گەسک ☰ جارو

**جەز / cez/**: ☜ **جێز**

**جەزا / ceza/**: ناو. سزا؛ پاداش ☰ پاداش؛ مُزد

**جەزایرچی / cezayirçî/**: ناو. پاسگر؛ حەسحەس؛ زیرەڤان ☰ پاسبان

**جەزایەرچی / cezayerçî/**: ناو. حەسەس؛ ئێشکدەری شەوانە ☰ عَسَس

**جەزبە / cezbe/**: ناو. جەزم؛ جەزمە؛ جەزەبە؛ هەڵەکا؛ سەمای دەروێشان؛ لە هۆش تەکینەوەی دەروێش لە زیکردا ☰ جَذبه

**جەزرەبە / cezrebe/**: ناو. جەزرەوە؛ ئازار؛ عەزیەت ☰ آزار

⊡ **جەزرەبە دان**: ئازار دان؛ عەزیەت دان ☰ آزار دادن

**جەزرەبە دیتن**: جەزرەبە کێشان؛ ئازار دیتن؛ سزا دیتن ☰ آزار کشیدن

**جەزرەبە کێشان**: ☜ **جەزرەبە دیتن**

**جەزرەوە / cezrewe/**: ☜ **جەزرەبە**

**جەزم / cezm/**: ☜ **جەزبە**

⊡ **جەزم بوون**: حاڵ لێ هاتن ☰ بە حالت جذبە افتادن

**جەزمە / cezme/**: ☜ **جەزبە**

**جەزەبە / cezebe/**: ☜ **جەزبە**

**جەزیا / cezya/**: ☜ **جزیا**

**جەزیرە** / cezîre/: ناو. جێـزوک؛ جزیـرە؛ ئـاد ☰ جزیره

**جەزیـە** / cezye/: نـاو. *[ئیـسلام]* سـەرانە؛ پیتـاکی تایبەت کە ناموسوڵمانان دەبوا بە فەرمانـڕەوای موسوڵمانانیان بدایە ☰ جزیه

**جەژن** / cej(i)n/: ☜ **جێژن**

**جەژنان** / cejnan/: ☜ **جێژنان**

**جەژنانە** / cejnane/: ☜ **جێژنانە**

**جـــــەژنموارەکی** / cej(i)nm(i)warekî/: ☜ **جێژنەپیرۆزە**

**جەژنە** / cejne/: ☜ **جێژن**

**جەژنەپیرۆزە** / cejnepîroze/: ☜ **جێژنەپیرۆزە**

**جەژنەچەقالـە** / cejneçeqale/: نـاو. جێژنێکـــی جوولەکانـــە، چوالـــە بـــادام و تـــۆمی تێـــدا دەترووکێنن ☰ از اعیاد یهود

**جەژنەفـەقیرە** / cejnefeqîre/: نـاو. جێژنێکـــی جوولەکانە، ئەبێ نانی کـۆنی تێـدا بخـۆن ☰ از اعیاد یهود

**جەسپەر** / cesper/: ناو. سنوور؛ کەوشەن ☰ مرز

**جەستە** / ceste/: ناو. جەسە؛ لـەش؛ ئەنـدام ‹بـە هاوین جەستە خەستەی دەردی گەرمام/ بە زستان دڵشکستەی بەردی سەرمام «نالی»› ☰ تن؛ بدن

**جەستەیی** / cesteyî/: ناوەڵناو. لەشـی؛ سـەر بـە جەستە ☰ بدنی

**جەسە** / cese/: ☜ **جەستە**

⊡ **چونە جەسەی شتێ/ کەسێکەوە**: پـەلاماری بـە سەبر و بە دزی بردن بۆ شـتێ/ کەسـێک ☰ پاورچین سراغ چیزی/ کسی رفتن

**جەشن** / ceşn/: ☜ **جێژن**

**جەعفەری** / ce'ferî/: ☜ **جافری**

**جەغجەغە** / ceğceğe/: ناو. کۆل و بیر؛ چـەرخ و تەنافی ئاو هەڵگوێزان لـە بـیر ☰ چـرخ و تنـاب آبکشی از چاه

**جەغز** / ceğz/: ناو. جخز؛ جغـز؛ جـوغز؛ جـەخز؛ جەخیز؛ جێخێز؛ چزخ؛ چـووز؛ کێـڕی گرۆڤـەر ‹لەم جەغزە کە شوێنی هاتوچۆی هەموانە/ بێ ژێر و ســەرە و دوور لــە پــوان و ســوانە «هــەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ☰ دایره

**جەغزی** / ceğzî/: ناوەڵناو. گرد؛ گردە ☰ دایرەای

**جـەغزینگ** / ceğzîng/: نـاو. پــەڕگار؛ پەلکــدار؛ پەڕگاڵ ☰ پرگار

**جـەغزێن** / ceğzên/: نـاو. ١. زاپـێن؛ سـواپێن؛ گەمـە بـە زاپ ☰ ٢. تـۆپێنی نـاو جـەغز ☰ ١. شن‌بازی ٢. توپ‌بازی در شنزار

**جەغەتاو** / ceğetaw/: ناو. چـەوراوێ کـە پـاش کوڵاندنی گۆشت بە سەر چێشتەوە دەکەوێ ☰ آب و چربی گوشت پخته

**جەغەتو** / ceğetû/: ناو. جەغەتە؛ جەڵغە؛ ئـاوی دەڵەمە ☰ آب نیم‌بند

**جەغەتـە** / ceğete/: نـاو. ١. ☜ **جـەغـەتـو** ٢. قەتماخە؛ خوێنی مـەییو ☰ ١. ☜ **جەغەتـو** ٢. خون کبره شده

**جەفا** / cefa/: ناو. ئازار ☰ جفا

**جەفت** / ceft/: ناو. جفت؛ کلاوی بـەڕوو ☰ جفـت بلوط

**جەفتین** / ceftîn/: چاوگ. خۆشە کردنی پێستی ئاژەڵ بە توێکڵی بەڕوو ☰ دباغی پوست با بلوط

**جەفل** / cefl/: ناو. ترس ☰ ترس

**جەفلانـدن** / ceflandin/: چـاوگ. ترســـاندن ☰ ترساندن

**جەفلین** / ceflîn/: چاوگ. ١. ترسان؛ ترسیان ٢. ماندوو بوون ٣. خـاو بوونـەوە ☰ ١. ترسـیدن ٢. خسته شدن ٣. سُست شدن

**جەفەنگ** / cefeng/: ناو. حەنەک؛ گاڵتە ‹بۆ دەبێ بێت و بکا مەیخانە تـەنگ/ شـوێنی دیکـە زۆرە بـۆ گاڵتە و جەفەنگ «هێمن»› ☰ شوخی

⊡ **جەفەنگ لێدان**: گاڵتە کردن ☰ شوخی کردن

**جەفەنگباز** / cefengbaz/: ئاوەڵناو. شوخیباز؛ گاڵتەچی ☰ شوخیباز

**جەفەنگبازی** / cefengbazî/: ناو. تیتاڵی ☰ لودگی

**جەڤلاندن** / cevlandin/: چاوگ. هەژاندن؛ داچڵەکاندن ‹بە ڤێ دەنگێ هاتنە جەڤلاندنێ› ☰ شوکە کردن

**جەقەتاو** / ceqetaw/: دەنگ. مرق؛ مرک؛ جەغەتاو؛ چەوراییی سەر گۆشتاو ☰ چربی روی آبگوشت

**جەک** / cek/: ناو. هەڵێن؛ ئامرازێک بۆ بەرز کردنەوەی شتی قورس ☰ جَک

**جەگەر** / ceger/: ☜ جەرگ

**جەگەن** / cegen/: ناو. ١. گیایەکە گەڵاکانی چەشنی گیازەڵمە دریژ و باریک و تیژە، لاسکەکەی چەشنی زەل دریژ و خڕە ٢. کەڕەپوو؛ کەڕۆک ☰ ١. جگن ٢. لوئی؛ کرفو

**جەل** / cel/: ناو. ١. جەلد؛ چەلاک؛ داری دریژ بۆ مازوو و گویز و ... تەکاندن ٢. ☜ جوانەگا ☰ ١. چوب بلند تکاندن مازو ٢. ☜ جوانەگا

**جەلاب** / celab/: ناو. ١. جەلاد؛ جەللاد؛ سەربڕی میر ٢. *(مەجاز)* کەوی بنە ☰ ١. جلاد ٢. کبک شکاری

**جەلاد** / celad/: ناو. جەلاو؛ میرغەزەب؛ سەربڕ؛ جەلاب؛ جەللاد ☰ جلاد

**جەلاقی** / celaqî/: ناو. دۆشاوی خەست؛ دمسی تیر ☰ شیرەی غلیظ انگور

**جەلال** / celal/: ناو. تەمتەراق؛ دەبدەبە؛ شکۆ ☰ طمطراق؛ دبدبە

**جەلاو** / celaw/: ☜ جەلاد

**جەلاوی** / celawî/: ناو. قەوزەی سەر ئاوان ☰ جُلبک

**جەلجەلۆت** / celcelot/: ☜ جەلجەلوت

**جەلجەلوت** / celcelût/: ناو. جەلجەلۆت؛ دۆعا و پرتەپرتی جادووگەران ☰ اوراد جادوگران

**جەلد** / celd/: ناو. ١. داردەستی دریژ و باریک ٢. ☜ جەل-١ ☰ ١. چوبدستی بلند و باریک ٢. ☜ جەل-١

**جەلدە** / celde/: ناو. قامچی؛ شەلاخ ☰ تازیانە

**جەلسە** / celse/: ناو. جەرسە؛ جلسە؛ پارچەیەک بوو ژنان دەیانکردە کلۆنجە ‹جەلسە کاری تارانێ/ تەڕ نابێ بە بارانێ «فۆلکلۆر»› ☰ نوعی پارچە

**جەللاد** / cellad/: ☜ جەلاد

**جەللە** / celle/: ناو. ڕیخ؛ شیاکە؛ پیسی گا و مانگا ☰ سرگین گاو

**جەلۆ** / celo/: ئاوەڵناو. سەرسەری؛ ئەڵوات؛ هەرزەپیاو ☰ لات

**جەلە** / cele/: ناو. جەڵە: ١. کۆمەڵی حەیوانە کێوی ٢. کۆی مالاتی بە زنجیرە تێکخراو ‹ڕێوی پێشەنگی جەلەی وشتر بێ/ سەیرە و سەمرە بار بگاتە جێ «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ٣. گەردانە لە گیا و گوڵ کە ئەیخەنە ملەوە ‹جەلەی گاگێرە زوو ئەکرێتەوە «مەسەل»› ☰ ١. گلەی حیوانات وحشی ٢. حلقەای از احشام بەهم بستە شدە ٣. گردنبندی از گل و گیاە

⊡ **جەلە کردن**: تێکخستنی مالات ‹گاگێرەی جەلە کردووە› ☰ بە هم بستن احشام

**جەلەب** / celeb/: ناو. هەوسار؛ کلکەڕەشمە؛ پەتی ملی حەیوان ☰ افسار

**جەلەبک** / celebik/: ☜ جەلەوك

**جەلەبەست** / celebest/: ئاوەڵناو. جەلەبەند؛ ڕیزکەر ☰ ردیفساز احشام

⊡ **جەلەبەست کردن**: پێکەوە بەستنی وشتر و دەوار و ڕیز کردنیان ☰ ردیف کردن و بە هم

بستن حیوانات

**جەلەبەند** / celebend/: ☜ **جەلەبەست**

**جەلەوک** / celewik/: ناو. جەلەبک؛ پەلەپیتکەی تفەنگ ▤ ماشەی تفنگ

**جەلیاندن** / celyandin/: چاوگ. ١. دەرهێنان ٢. دەرکردن ▤ ١. استخراج کردن ٢. اخراج کردن

**جەڵتە** / celte/: ناو. ١. خوێنی بەسیاگ ٢. نەخۆشی سەکتە کە بە هۆی جەڵتەوە بەدی دێ ▤ ١. خون لخته ٢. سکته

**جەڵتەخوێن** / celtex(i)wên/: ناو. لەگرسە؛ خوێنی مەییو ▤ لخته خون

**جەڵد**[١] / celd/: ناو. جلد: ١. بەرگی کتێب و دەفتەر ٢. بەرگ؛ یەکەی کتێب و دەفتەر ٣. شووماسی؛ لیزگەماسی بە شوولکەوە کراو ▤ ١. جلد کتاب و دفتر ٢. واحد کتاب و دفتر ٣. رشته ماهی در ترکه شده

**جەڵد**[٢]: ئاوەڵناو. ١. فرز؛ چاپک ٢. بەدەستوبرد ▤ ١. چابک ٢. کاری

**جەڵدانە** / celdane/: ئاوەلکار. بەدەستوبردەوە ▤ با زیرکی و تردستی

**جەڵغە**[١] / celğe/: ناو. ١. سەهۆڵی خۆنەگرتوو؛ سۆڵی نیوەبەنیوە ٢. دوو داری سەرتاشراوی بە یەکەوە لکێنراو ٣. /مەجاز/ کاری نیوە و ناتەواو ▤ ١. کاشه ٢. دو چوب سر به هم آورده شده ٣. کار نیم‌بند

**جەڵغە**[٢]: ئاوەڵناو. خۆنەگرتوو؛ تەواو نەبەستراو ▤ نیم‌بند

**جەڵە** / cele/: ☜ **جەلە**

**جەڵەب**[١] / celeb/: ناو. ١. کۆمەڵە مەڕ و بزنێ کە بۆ فرۆشتنی دەبەن ٢. ئەیاغ؛ حەیوانی عەیبدار و کەم‌نرخ ٣. دەستە؛ کۆمەڵ ٤. ☜ **جەڵەو ـ٣** ▤ ١. گلەی فروشی ٢. دام بُنجُل ٣. گروه ٤. ☜ **جەڵەو ـ٣**

**جەڵەب**[٢]: ئاوەڵناو. ١. نارەسەن؛ نانەجیب ‹جەڵەب وامقان گوم کەردەی عوزرا/ هەرکام لە مەعشووق ویشان بین جودا «شامی کرماشانی»› ٢. بەدجنس؛ بەدفەڕ ▤ ١. بداصل ٢. بدجنس

**جەڵەبچی** / celebçî/: ناو. جەڵەبکڕ؛ بازرگانی مەڕ و بزن و ڕەشەماڵ ▤ تاجر دام

**جەڵەبدار** / celebdar/: ئاوەڵناو. خاوەنی جەڵەب ▤ دارای دام فروشی

**جەڵەبکڕ** / celebkiř/: ☜ **جەڵەبچی**

**جەڵەبی**[١] / celebî/: ناو. بەدجنسی؛ بەدفەڕی؛ خراوەکێڵی ▤ بدجنسی

**جەڵەبی**[٢]: ئاوەڵناو. جەڵەوی؛ درۆیین؛ درۆینە ▤ تقلبی

**جەڵەو** / celew/: ناو. جەڵەب: ١. هەوسار؛ کلکەڵغاو؛ کلکەڕەشمە ٢. کۆمەڵ (مالات یان سواران) ‹جەڵەو جەڵەو گەل سپی تەتاران/ دین دیدەکەت وە چەم مەداران «مەولەوی»› ٣. جەڵەب؛ کۆمەڵێک مەڕ و بزن کە بۆ فرۆشتن دەیبەن ▤ ١. افسار ٢. دسته؛ گروه ٣. دسته‌ای از احشام که برای فروختن می‌برند

**جەڵەوی** / celewî/: ☜ **جەڵەبی**[٢]

**جەم**[١] / cem/: ناو. ١. ژەم؛ هەلی نان خواردن ‹جەمی نیوەڕۆ› ٢. تابار؛ لنگەبار ٣. کۆمەڵە؛ جەماعەت ▤ ١. وعدەی غذا ٢. لنگه‌بار ٣. گروه

**جەم**[٢]: ئاوەڵناو. کۆ ‹یاران جەمن› ▤ جمع

◘ **جەم بوون**: ١. لە پاڵ یەکدا بوون ٢. کۆ بوونەوە؛ خڕ بوونەوە؛ کۆمەڵ کردن ▤ ١. با هم بودن ٢. اجتماع کردن

**جەم بوونەوە**: کۆ بوونەوە ▤ گرد هم آمدن

**جەم کردن**: ١. هێنانە پاڵ یەک ٢. پێچانەوە ▤ ١. جمع کردن ٢. برچیدن

**جەم کردنەوە**: کۆ کردنەوە ▤ جمع کردن

**جەم**[٣]: ئامراز. نک؛ لا؛ کن ‹پەرەی من جەم تەیە›

▆ نزد؛

**جەمات / cemat/:** ☜ **جەماعەت**

⊡ **جەمات گرتن:** کۆڕ بەستن ▆ تشکیل دادن گردهمایی

**جەماعەت / cema'et/:** ناو. جەمات: ١. ئاپۆرە؛ خەڵک؛ خەڵکی ٢. کۆمەڵ؛ کۆما؛ دەستە ‹ئێستاکە کەوا جەماعەتی وان/ ئەسلن بە نەسەب کەریم و شوجعان «جاجی قادر»› ٣. *[ئیسلام]* جەمات؛ نوێژی بە کۆمەڵ؛ نمێژ بە هەڤرا ‹بانگمان تەواو کرد، جەماعەت بەسرا/ بۆ ئیمامەتی کوێرێک پێش خرا! «پیرەمێرد»› ▆ ١. مردم ٢. گروه ٣. نماز جماعت

**جەمام / cemam/:** ئاوەڵناو. بار و دۆخی ڕەق و ئاوساو بوونی ئەندام ‹باسکم جەمامە›. هەروەها: **جەمام بوون** ▆ کوفتە

**جەمامشکێن / cemamş(i)kên/:** ئاوەڵناو. داگیراو بە هۆی ئاوساوی ئەندامەوە ▆ کوفتە

**جەمامی / cemamî/:** ناو. هەڕەکیاوی؛ ڕەق و ئاوساویی ئەندام ‹ڕۆژی نەورۆز کردمە لامال تا جەمامی دەربچێ/ ئەووەڵی پاییز لەسەرخۆ گەییە کانی بۆ سەراوا! «قانع»› ▆ کوفتگی

**جەماندن / cemandin/:** ☜ **جڤاندن**

**جەماوەر / cemawer/:** ناو. ١. پڕایی خەڵک ٢. خەڵک؛ هەموو خەڵک یان دانیشتوانی وڵاتێک ▆ ١. تودە ٢. جمعیت

**جەمبازی / cembazî/:** ناو. ١. جامبازی؛ چۆداری؛ چێواری؛ کاری کڕین و فرۆشتنی ئاژەڵ و وڵاخ ٢. تەنافبازی ٣. فێڵ و تەڵەکە ▆ ١. چوبداری ٢. طناب‌بازی ٣. حیله‌گری

**جەمبور / cembûr/:** ناو. کۆمەڵی زۆر؛ دەستەی گەورە ▆ جُمهور

**جەمبورە / cembûre/:** ناو. ئاپۆرە؛ جەماوەر ▆ ازدحام

**جەمتانە / cemtane/:** ئاوەڵناو. دروستکار؛ درووسکار ▆ درستکار

**جەمجاخ / cemcax/:** ناو. ئاپۆرە؛ جەماوەر ▆ جمعیت مردم

**جەمجتین / cemcitîn/:** چاوگ. شلەقانی شتی شل ▆ به هم خوردن مایع

**جەمجستین / cemcistîn/:** چاوگ. جەمقان؛ لێکدانی شتی تراو ▆ به هم زدن مایع

**جەمجقاندن / cemc(i)qandin/:** چاوگ. بە قامکان هەڵپشاوتن و هەویر کردن ▆ با دست خمیر کردن

**جەمجقین / cemciqîn/:** چاوگ. بە قامکان هەڵپشێوران و بوونە هەویر ▆ خمیر شدن با دست

**جەمخۆنە / cemxone/:** ناو. شوێنی کۆ بوونەوە و بەجێ هێنانی ڕێوڕەسمی ئایینی ڕێڕەوانی ڕێبازی یارسان ▆ عبادتگاه پیروان اهل حق

**جەمداندن / cemdandin/:** چاوگ. ١. کردنە سەهۆڵ؛ ڕچاندن ٢. سارد کردن ▆ ١. مُنجمد کردن ٢. سرد کردن

**جەمدی / cemdî/:** ئاوەڵناو. بەستوو؛ بەستەڵەک؛ سەهۆڵ‌کردوو ▆ مُنجمد

**جەمدین / cemdîn/:** چاوگ. ١. سەهۆڵ بەستن؛ بوونە سەهۆڵ ٢. سڕ بوون لە سەرمان ▆ ١. منجمد شدن ٢. از سرما کرخ شدن

**جەمساندن / cemsandin/:** چاوگ. سوور کردنەوە؛ لە ناو ڕۆندا برژاندن ▆ سرخ کردن

**جەمسەر / cemser/:** ناو. ١. جێگەی پێکەوە لکانی دوو شت ٢. قوتب؛ سەر و بنی شتێکی تۆپەڵ، بەتایبەت گۆی زەوی ▆ ١. محل اتصال ٢. قُطب

⊡ **جەمسەری باشوور:** باشووری‌ترین شوێنی زەوی ▆ قطب جنوب

**جەمسەری باکوور**: باکووری‌ترین شوێنی زەوی ☰ قطب شمال

**جەمقان** / cemqan/: ☜ **جەمجستین**

**جەمک** / cemk/: ناو. ژەمک؛ ژەمەنە: ١. ئەوەندە ماست کە جارێک دەکرێتە مەشکەوە ٢. کاری برە ـ برە مژاندنی بێچوو لە گوانی دایک بۆ شیر دادان ‹گوێلکێ جەمک کە!› ☰ ١. مقدار ماستی کە یک بار در مشک ریزند ٢. عمل اندک ـ اندک مُک زدن نوزاد به پستان مادر

**جەمگە** / cemge/: ☜ **جومگە**

**جەممردوو** / cemmirdû/: ناوەڵناو. جەممردە؛ ژەممردوو؛ بێچوویێک کە لە بەر کەمشیری دایک لەڕ و لاوازە ☰ نوزاد لاغر و بیجان از کم شیری مادر

**جەممردە** / cemmirde/: ☜ **جەممردوو**

**جەموجۆر** / cem û cor/: ناوەڵناو. ڕێکوپێک و کۆ ☰ جمع‌وجور

**جەمەخوێڕیلە** / cemx(i)wêřîle/: ناو. ژەمەخوێڕی؛ عەسرۆژە؛ نان و چای دوای بانگی عەسر ☰ عصرانە

**جەمەد** / cemed/: ناو. سۆڵ؛ سەهۆڵ؛ یخ؛ یەخ ☰ یخ

**جەمەدانی** / cemedanî/: ناو. جامانە؛ جامەدانی؛ ئاغابانوو؛ پارچەی سەروێنی پیاوان ☰ دستار

**جەمەک** / cemek/: ناو. مز؛ کرێ؛ پێمز؛ حەقدەس ☰ مُزد

**جەمەلۆن** / cemlon/: ناو. شێروانی؛ میچی لێژی کانزایی ☰ شیروانی

**جەمیداندن** / cemîdandin/: چاوگ. سارد کردنەوە ☰ سرد کردن

**جەمیدین** / cemîdîn/: چاوگ. سارد بوونەوە ☰ سرد شدن

**جەمین**[1] / cemîn/: چاوگ. ١. لەرزین ٢. بزووتن ☰ ١. لرزیدن ٢. تکان خوردن

**جەمین**[2]: ناو. توێڵ؛ هەنیە؛ ئەنی؛ ناوچەوان ☰ جبین

**جەمینۆک** / cemînok/: ناو. کار و ڕەوتی کۆ بوونەوە بۆ کەین‌وبەین کردن ☰ گردآمدن برای توطئەچینی

**جەناب** / cenab/: ناو. ١. وشەی ناو بردنی کەسێ بە ڕێزەوە ‹جەنابی سەرۆک› ٢. *[پلار]* وشەی بانگ کردنی کەسێک بە تیزەوە ‹جەناب! ئەمە بوو قەول و قەرارت؟› ☰ ١و٢. جناب

**جەنازە** / cenaze/: ناو. تەرم؛ لاشەی مردوو ☰ جنازە

**جەنای** / cenay/: چاوگ. ئەنجنین؛ جن ـ جن کردن ☰ انجیدن

**جەنتک** / centik/: ناو. جەندک؛ خورجێنی چکۆڵە کە بە سەر شانییەوە دەدەن ☰ خورجین کوچک

**جەنجاڵ**[1] / cencał/: ناو. هەرا و هوریا؛ زەنا ـ زەنا؛ چەقەوگوڕە ☰ جنجال

**جەنجاڵ**[2]: ناوەڵناو. شلۆق؛ پڕهەرا و هوریا ☰ شلوغ

**جەنجاڵی** / cencałî/: ناو. شلۆقی؛ قەرەباڵغی ☰ شلوغی

**جەنجەر** / cencer/: ناو. گام؛ هەباشە؛ چوو؛ مۆشەن ☰ خرمنکوب

**جەنجەڕ** / cenceř/: ناو. ١. چەرخ و دۆلابی ئاو هەڵکێشان ٢. خەرمانکووب؛ ئامرازی لە دار و ئاسن بۆ گێرە کردنی کلۆش ☰ ١. چرخ چاه ٢. خرمنکوب

**جەنجەنەک** / cencenek/: ناو. پولیس؛ پۆلیس ☰ پلیس

**جەندرمە** / cendirme/: ناو. ١. جاندارم؛ قۆڵچی پولیسی ڕێگاوبان و دەوروبەری شار ٢. پولیسی تورکان ☰ ١. ژاندارم ٢. پلیس تُرک

**جەندک** / cendik/: ☜ **جەنتك**

**جەندەرە** / cendere/: ناو. ١. دەق؛ دەقاق؛ کاری کـەتیرە لـە قومـاش دان ٢. تەنگانـە؛ تـەنگ و چەڵەمە ▤ ١. آهار ٢. تنگنا

**جەنـدەک** / cendek/: نـاو. کـەلاک؛ لاش؛ تـەرم ‹خاریـان دەدڕێ و دڵـی نـزاران/ بـۆ ناشـتنی جندەکی نەیاران «هەژار، *مەم و زین*»› ▤ لاشە

**جەنقاندن** / cenqandin/: چاوگ. ترساندن؛ زراو بردن ▤ ترساندن

**جـەنقین** / cenqîn/: چـاوگ. ١. ڕاپـەڕین؛ داچڵەکان؛ داچڵەکیان ٢. ترسـان؛ زراو چـوون ▤ ١. یکّە خوردن ٢. ترسیدن

**جەنگ** / ceng/: ناو. شـەڕ؛ هـەرا و لێکـدانی بـە دوژمنی ▤ جنگ

⊡ **جەنگ کردن**: شەڕ کردن ▤ جنگیدن

**جـەنگاوەر** / cengawer/: ناوەڵـناو. شەڕڤـان؛ شەڕکەر؛ چەکداری بەشدار لە شەڕدا ▤ جنگاور

**جـەنگخواز** / cengx(i)waz/: ناوەڵناو. شەڕاشـۆ؛ شەڕانی ▤ ستیزەجو

**جەنگە** / cenge/: ناو. هـەڕەت؛ جەرگـە ‹هـاوین جەنگەی کارە و زستان کاتی وچان› ▤ عنفوان

**جەنگـــەپۆپێ** / cengepopê/: نـــاو. شەڕەدەندووکێ؛ شەڕەجوێن ▤ جنگ لفظی

**جەنگەرانی** / cengeranî/: ☜ **جەنگەری**

**جەنگـەری** / cengerî/: ناوەڵـناو. جەنگـەرانی؛ شەڕانی؛ شەڕاشۆ ▤ ستیزەجو

**جەنگەڵ** / cengeł/: نـاو. لێڕ؛ لێڕەوار؛ دارستان ▤ جنگل

**جەنگەڵی** / cengełî/: ناوەڵناو. ١. لێڕەواری؛ سەر بـە دارسـتان ٢. *[مەجاز]* دەشـتەکی؛ کێفیلـە؛ بێـوەری لـە فەرهـەنگ و شارسـتانییەت ▤ ١. جنگلی ٢. وحشی

**جەنگی** / cengî/: ناوەڵناو. شـەڕکەر؛ واز لـە شـەڕ ‹کەڵەشێری جەنگی› ▤ جنگی

**جـەنگین** / cengîn/: چـاوگ. شـــەڕ کـــردن ‹ڕاوەسـتاوین وەک پاڵـەوان/ ئەجـەنگین تـا شـەڕ نامێنێ «گۆران»› ▤ جنگیدن

**جەننەت** / cennet/: ناو. بەهەشـت؛ بوهیشـت ▤ بهشت

**جەنوب** / cenûb/: ناو. باشوور؛ یەکێ لە چـوار لا سەرەکییەکان. بەرانبەر: **باکوور** ▤ جنوب

**جەنە** / cene/: ناو. ١. مان؛ گە ٢. بیانوو؛ پەڵـپ ▤ ١. اعتصاب ٢. بهانە

⊡ **جەنە گرتن**: ١. مان گرتن ٢. بیانوو گـرتن ▤ ١. اعتصاب کردن ٢. بهانە گرفتن

**جەنیای** / cenyay/: چاوگ. ئەنجران؛ جن ـ جن بوون ▤ انجیدە شدن

**جەنیقاندن** / cenîqandin/: چاوگ. ١. ترسـاندن ٢. ڕەتاندنی نێچیر و لە غـار وەسـتاندنی ▤ ١. ترساندن ٢. خستە کردن شکار

**جەنیقین** / cenîqîn/: چاوگ. ١. ترسان؛ ترسیان ٢. وەسـتان لەبـەر مانـدوویی ▤ ١. ترسـیدن ٢. توقف کردن از فرط خستگی

**جەو** / cew/: نـاو. ١. جـۆ؛ هەواڵـی گـەنم ٢. برینگ؛ مقەسـتی خـوری برینـەوە ▤ ١. جـو ٢. قیچی پشم‌چینی

**جەواب** / cewab/: ☜ **جواب**

**جەوادە** / cewade/: ناو. جەواڵە؛ مەشکەی ئاو ▤ مشک آب

**جەواز** / cewaz/: ناو. ئیجازەنامە ▤ جواز

**جەواڵ** / cewał/: ☜ **جواڵ**

**جەواڵو** / cewałû/: ناو. کەژیلان؛ چاو کەژیلان؛ جۆرە گیایەکە لە خێزانی گیامارانە ▤ تمشکین

**جەواڵە** / cewałe/: ☜ **جەوادە**

**جەواڵی** / cewałî/: نـاو. شـووڵە؛ تێـڕ ▤ جـوال دوتایی

**جەوان**[1] / cewan/: ناو. ١. مەرەزەوان؛ ئاگاداری مەرەزە ٢. لاو؛ گەنج ‹مەجنوونی جیلوەی ئەو پەرییەم دیوە هەرچی دی/ یەغماگەریکە عەقڵی لە پیر و جەوان دزی! «مەحوی»› 🇮🇷 ١. شالیکار ٢. جوان

**جەوان**[2]: ئاوەڵناو. لاو؛ گەنج؛ جوان ‹خوەش پەریشان سیفەت و مەجمەعەیێ سوورەتێ حالین/ پیرێ عیشقین و جەوان تەبع و ل دل عەهدێ شەبابە «مەلای جزیری»› 🇮🇷 جوان

**جەوانمەرد** / cewanmerd/: ئاوەڵناو. جوامێر؛ جامێر؛ مێرخاس؛ بە خدە و ئاکاری چاکەوە ‹لە ژێر باری غەمی زولفی، خەتی هات و ڕەهای کردم/ ئیلاهی قەد جەوانمەردان نەکەی داماو و دەرمەندە «وەفایی»› 🇮🇷 جوانمرد

**جەواهیر** / cewahîr/: ☜ جەواهێر

**جەواهێر** / cewahêr/: ناو. جەواهیر؛ هەرکام لەو بەردە گرانباییانەی دەکرێنە خشڵ 🇮🇷 جواهر

**جەواهێرات** / cewahêrat/: ناو. کۆمەڵە بەرد و خشڵی بەقیمەت 🇮🇷 جواهرات

**جەوبڕ** / cewbiř/: ناو. برینگ؛ مقەستی خوری برینەوە 🇮🇷 قیچی پشم‌چینی

**جەوت** / cewt/: ناو. جفت؛ جووت؛ کلاوەبەڕوو 🇮🇷 جُفت بلوط

**جەوتک** / cewtik/: ناو. جانتای لە چەرم؛ خورجێنی چەرمین 🇮🇷 ساک یا خورجین چرمی

**جەوجەو** / cewcew/: ناو. جەوجەوک؛ تووتکەسەگ؛ تولەی کونەڕۆی چووک 🇮🇷 تولەسگ کوچک

**جەوجەوک** / cewcewik/: ☜ جەوجەو

**جەوجەوێن** / cewcewîn/: ناو. جۆجۆ؛ هەیجۆهەیجۆ؛ تووت و فەراقەت؛ خازەڵێ؛ هەیجۆهەیجۆیێن 🇮🇷 از بازی‌های کودکان

**جەودک** / cewdik/: ناو. خێگەی گچکە 🇮🇷 خیگ کوچک

**جەور**[1] / cewr/: ناو. ئازار؛ زەحمەت ‹جەژنی ئێمە بوو بە دوو ئەوساڵ بە لوتفی کردگار/ با لە دڵ دەرکەین خەم و حەسرەت، هەموو جەور و جەفا «ئاوات»› 🇮🇷 جور

**جەور**[2]: ئاوەڵناو. دژوار؛ سەخت ‹تاکەی بار جەور مەنەی وە شانم؟/ ئەیووب نیم وەی تەور کرد ئیمتحانم «شامی»› 🇮🇷 سخت؛ پرزحمت

**جەورک** / cewrik/: ناو. تووتکە تانجی هەتا یەکساڵان 🇮🇷 تولەی تازی

**جەوز** / cewz/: ناو. ١. گوێز؛ گووز؛ قۆز؛ گیز ٢. دەنکی بۆنخۆشی داری سەوزی جەواز کە بۆ دەرمان بە کار دێت ٣. ☜ جەوی 🇮🇷 ١. گردو ٢. جوز بویا ٣. ☜ جەوی

**جەوسەق** / cewseq/: ناو. جادە؛ کاروانەڕێ 🇮🇷 جادە

**جەوک** / cewk/: ☜ جەوی

**جەوکەر** / cewker/: ناو. جۆلا؛ جۆلای جاوتەن 🇮🇷 کرباس‌باف

**جەوگ** / cewig/: ☜ جەوی

**جەولخ** / cewlix/: ☜ جواڵ

**جەولەخ** / cewlex/: ناو. جواڵ؛ جەواڵ؛ کیسەی دەغڵی گەورەی یەکلایی لە خوری چندراو 🇮🇷 جوال

**جەوە** / cewe/: ☜ جەوی

**جەوەرە** / cewere/: ☜ جەبەرە

**جەوەندە** / cewende/: ☜ جەوەنە

**جەوەنە** / cewene/: ناو. جەوەندە؛ توورەکەی چەرمین بۆ ئاو تێدا هەڵگرتن ‹ئەو ئاوە ساردە لە ئەو جەوەنە/ دابینێ بۆ خۆت هەر پێی پێکەنە «قانع»› 🇮🇷 توبرەی چرمی حمل آب

**جەوهەر** / cewher/: ناو. جەهوەر: ١. تیغی زاخ‌دراو؛ تێغ ئاودار ‹بڕۆت تیغێکە وسمەی

سەیقەڵ و مەسلوول و مووکارە/ کە عیشوەی جەوهەرە، ڕەمز و ئیشارەی ئاوی مەودایە «نالی»› ٢. ڕەنگ بۆ نووسین ‹جەوهەری قەڵەم› ٣. ڕەنگی بەن و ڕیس ‹جەوهەری گوڵخار؛ جەوهەری سوور› ٤. */مەجاز/* بڕشت؛ لێهاتوویی؛ توانایی ‹لەو ساڵەوە کە حاکمی بابان بەدەرکران/ نەیدیوە کەس لە چهرەیی کەس جەوهەری هونەر «سالم»› ☰ ١. پَرنَد ٢. جوهر نوشتن ٣. رنگ رنگرزی ۴. استعداد

**جەوهەردار**[1] / cewherdar/: ناو. دار جەوهەر؛ جۆرێ چنار ☰ نوعی چنار

**جەوهەردار**[2]: ئاوەڵناو. ١. ئاودار؛ بە خاڵ و میل ٢. هێژا؛ لێهاتوو ٣. تیژ و بەکار (بۆ ئامراز) ☰ ١. جوهردار ٢. بااستعداد ٣. تیز و کاری

**جەوهەرمازوو** / cewhermazû/: ناو. تانەن؛ تراوێکی لە شینکە گیراو بۆ دەباغی و ڕەنگرێژی و... بە کار دێ ☰ تانن؛ شیرەی مازو

**جەوی** / cewî/: ناو. جەوز؛ جەوک؛ جەوگ؛ جەوە؛ جیوە؛ جاوی؛ ژوی؛ شیرەی هەنگوژە؛ شیرەی گیای هەڵز؛ جیوەی ڕەشەگوێنی ڕەقهەڵاتووی دار ☰ انگُم

**جەه** / ceh/: ناو. جۆ ☰ جو

**جەهاد** / cehad/: ☜ **جیهاد**

**جەهان** / cehan/: ☜ **جیهان**

**جەهانبین** / cehanbîn/: ناو. */کینایە/* چاو؛ دیدە ‹هەنووز نەشناسوم چەپ و ڕاست دەست/ دەست جەهاندار جەهانبینم بەست «شامی کرماشانی»› ☰ چشم

**جەهانبینی** / cehanbînî/: ☜ **جیهانبینی**

**جەهاندار** / cehandar/: ناو. */ئەدەبی/* خودا؛ پەروەردگار ‹بنام بیچوون، جەهاندار فەرد/ موخبر جە هەر کار، تەبیب جە هەر دەرد «شامی کرماشانی»› ☰ خدا

**جەهتەر** / cehter/: ☜ **جاترە**

**جەهر** / cehr/: ناو. جەر؛ تووڕەیی؛ سڵی؛ ڕک ☰ خشم

**جەهرێ** / cehrê/: ناو. برینگ؛ دوێرد ☰ قیچی پشم بریدن

**جەهزەر** / cehzer/: ☜ **جۆزەرد**

**جەهوەر** / cehwer/: ☜ **جەوهەر**

**جەهەندەم**[1] / cehendem/: ناو. جەحەندەم؛ جەحەنم؛ جەحەنەم؛ جەحانم؛ جەهەننم؛ جەهەننەم؛ دۆژە؛ دۆزەق ☰ جهنم

**جەهەندەم**[2]: دوعا. بە جەحەندەم؛ بە توون؛ بە جەهانم ‹ناچی جەهەندەم!› ☰ به جهنم

**جەهەندەمی** / cehendemî/: ئاوەڵناو. جەهەننەمی؛ شیاوی ئاگری دۆزەق ☰ دوزخی

**جەهەنگ** / ceheng/: ناو. جۆرێک کوانی گەورە، لە لەشی وڵاخ دێ ☰ نوعی دُمل پوستی حیوان

**جەهەننم** / cehennim/: ☜ **جەهەندەم**

**جەهەننەم** / cehennem/: ☜ **جەهەندەم**

▣ **جەهەننەم داشی**: شتێکە وەک بەرد حەکیمی چاوان ناو پێڵووی پێ دەکرێنن ☰ سنگ جهنم

**جەهەننەمی** / cehennemî/: ☜ **جەهەندەمی**

**جەهێڵ** / cehêł/: ☜ **جەحێڵ**

**جەیران** / ceyran/: ناو. ١. ئاسک؛ کەژاڵ؛ مامز ‹جەیرانان گەل ـ گەل تازە کەردەن مەیل/ فەڕ وستەن ئەو زێد پای هەردەی دوجەیل «مەولەوی»› ٢. کیسەڵ؛ کاسەپشت ☰ ١. آهو ٢. لاکپُشت

**جهاڵ** / c(i)hał/: ناو. جوهاڵ؛ جەواڵ ☰ جوال

**جهمین** / cihmîn/: چاوگ. تۆپین؛ کەوتین ‹کەرێ مە جهمییە› ☰ سَقَط شدن

**جهوار** / cihwar/: ☜ **جیهوار**

**جهورک** / c(i)hurk/: ☜ **جۆرک ـ١**

**جی** / cî/: ☜ **جێ**[1]ـ۱

**جیا** / c(i)ya/: ئاوەڵناو. جویَ؛ جودا؛ جدا ☱ جُدا

▣ **جیا بونەوە:** جیاوە بوون؛ لێک‌هەڵبڕان؛ جودا بوونــەوە ‹جیــا بوونــەوەت دەردە بــەڵام، تــۆش دەزانی تامی نییە/ ژوان و شەوڕاو و دڵــداری، ڕاز و نیازی بە دیلی «هێمن»› ☱ از هم جدا شدن

**جیا کردنەوە:** جیاوە کردن؛ هــەڵاواردن؛ لێــک جودا کردن ‹ئەی گەلی خاوەن‌بــاوەڕان! ئەگــەر لە خودا بترسن، ئامێری جیــا کردنــەوەی پــاک و پیستان پێ دەدات و سووچەکانتان دەسڕێتەوە و لە خراپەتان دەبووریَ. خودا زۆر چاکەی لە لایــە «هەژار، *قورئان*»› ☱ جدا کردن

**جیاوە بون:** ☜ **جیا بونەوە**

**جیاوە کردن:** ☜ **جیا کردنەوە**

**جیات** / c(i)yat/: ☜ **جیاتی**

**جیاتی** / c(i)yatî/: ئــامراز. جیــات؛ لــە جیــاتی؛ جیۆتی؛ لە بــری؛ بــە جێــی؛ لــە بــاتی ‹جیــاتی موزەی ســفتەی باڵاکــەت/ چــێش بــۆ وە جــاڕووی گەرد پاڵاکەت؟ «مەولەوی»› ☱ به جایِ؛ در عوضِ

**جیا ـ جیا**[1] / c(i)ya c(i)ya/: ئاوەڵناو. جودا ـ جودا ‹ڕەشماڵی جیا ـ جیا لە چیادا› ☱ جُداگانه

**جیا ـ جیا**[2]: ئاوەڵکار. جوداـ جودا ‹جیا ـ جیا دامان لە چەمەکە› ☱ جُداگانه

**جیاخواز** / c(i)yax(i)waz/: ئاوەڵناو. جودایی‌خواز؛ جیاوازی‌خواز ☱ جُدایی‌طلب

**جیاخوازی** / c(i)yax(i)wazî/: ☜ **جودایی‌خوازی**

**جیاز** / c(i)yaz/: نــاو. ۱. باوانی؛ پێتەک؛ جیازی؛ ئەوەی بووک بۆ ماڵــی زاوای دەبــا ۲. کورتــانی وشــتر ۳. *[کینایــە]* کفــن؛ بــەرگی مــردوو ☱ ۱. جهیزیەی عروس ۲. پالان شتر ۳. کفن

**جیازی** / c(i)yazî/: ☜ **جیاز** ـ۱

**جیاکار**[1] / c(i)yakar/: ئاوەڵناو. جیاواز ‹کاری ئێمە جیاکارە› ☱ مُتفاوت

**جیاکار**[2]: ئاوەڵکار. بە جیا ‹جیاکار قســەی دەگــەڵ دەکەم› ☱ جُداگانه

**جیاکاری** / c(i)yakarî/: ☜ **جیاوازی**

**جیــاکراوە** / c(i)yak(i)rawe/: ئاوەڵــناو. ئاوارتــە؛ دوورخراوە ☱ مُتمایز

**جیــاواز**[1] / c(i)yawaz/: ئاوەڵــناو. جودایــەز: ۱. جیاکار ‹کە من بەد بکەم، سزای تۆیش بەد بیَ/ تۆ و مــن جیــاوازین لــە چییــا، بلــیَ؟ «گــۆران»› ۲. هەڵکەوتە ☱ ۱. مُتفاوت ۲. برجسته

**جیاواز**[2]: ئاوەڵــکار. جودایــەز؛ جیاکــار؛ تایبــەتی ‹جیــاواز چوومــە پێشــوازییەوە؛ جیــاواز دامنــا› ☱ جُداگانه؛ علیحدّه

**جیــــاوازی** / c(i)yawazî/: نــــاو. جیاکــــاری؛ جودایەزی؛ تۆفیر؛ فەرق ☱ تفاوت

▣ **جیاوازی کردن:** فەرق لــە بــەین دانــان؛ فــەرق خســتن ‹ئــەڕا جیــاوازی لــە بــەین کوڕەکانــت کەی؟› ☱ فرق نهادن

**جیـــــــــاوازی‌خواز** / c(i)yawazîx(i)waz/: ☜ **جیایی‌خواز**

**جیاوەبـو** / c(i)yawebû/: ئاوەڵــناو. تەڵاقــدراو؛ بیَ‌بەش‌کراو لە هاوسەر ☱ مُطلقه

**جیاوەکریــــاو** / c(i)yawekiryaw/: ئاوەڵــــناو. دەرهاوێژراو؛ فڕیَ‌دراو ☱ بیرون انداخته شده

**جیــایی**[1] / c(i)yayî/: نــاو. جــودایی ‹پەرســام یــە چێشەن ئــی زەردی خــەزان/ وات مــەیۆم نــە خــاو جیایی تەرزان «بێسارانی»› ☱ جُدایی

**جیایی**[2]: ئاوەڵناو. بە جیا؛ جیا لە یەک ‹مەســەلەی مەشوور: برامان برایی/ بەڵام بەو شــەرتە کیســەمان جیایی «قانع»› ☱ جُداگانه

**جیــــــــایی‌خوازی** / c(i)yayîx(i)wazî/: ☜ **جودایی‌خوازی**

**جیت** / cît/: ئاوەڵــناو. جووت؛ بەرانبــەری تــاک ☱ زوج

**جیجـک** / cîcik/: نـاو. ١. جـووچکی مـەل ٢. چۆلەکە 🇮🇷 ١. جوجه ٢. گُنجشک

**جیجە** / cîce/: ناو. جووچک؛ بێچووە مریشـک 🇮🇷 جوجه

**جیجی** / cîcî/: دەنگـەناو. [پـلار] دەنگـی ئـامێرە ژێدارەکان کە بـە کـەوان دەژەنـرێن 🇮🇷 صـدای سازهایی که با آرشه نواخته می‌شوند

**جیچـک** / cîçik/: نـاو. جووچــک؛ جووجەڵــە 🇮🇷 جوجه

**جیدانـە** / cîdane/: ناو. ١. کـزن؛ دانەوێڵــەیەکە گــای پــێ قەڵــەو دەکــەن ٢. ســیکەتۆرە؛ سیقەتۆرە؛ چینەدان 🇮🇷 ١. گاودانه ٢. ژاغر

**جیددی** / cîddî/: ئاوەڵناو. تـووڕکی؛ بنەوەشـی 🇮🇷 جدّی

**جیر** / cîr/: ناو. جیل؛ لاستیک؛ لاسیق 🇮🇷 جیر

**جیران** / cîran/: نـاو. هاوسـا؛ هاوسـایە؛ دراوسـێ ‹... لاوان، پیران، هاوسا و جیران، ئاوماڵ لـە گونـد لە هەواران، لـە هـەموو ئـاوایی و شـاران، خـوێش و غەوارە و ڕەمەکی، دووکاندار، جووتکـار، دەشـتەکی ... «هەژار، *چوار نامیلکه*»› 🇮🇷 همسایه

**جیرانان** / cîrannan/: نـاو. دەرودراوسـێ 🇮🇷 در و همسایه

**جیراندن** / cîrandin/: چـاوگ. دەنگ لێ هـاتنی تەختەی لێکدراو یان دەرگـای شـەق و شـڕ 🇮🇷 جِروجِر کردن

**جیرانــەتی** / cîranetî/: نــاو. هاوســـێتی؛ هاوسایەتی؛ هەڤسیایی 🇮🇷 همسایگی

**جیرە** / cîre/: ناو. ١. بەشەنان و بژیو ٢. مووچە و بەرات 🇮🇷 ١. جیره ٢. مُستمری

**جیرەبەر** / cîreber/: ☜ **جیرەخۆر**

**جیرەخـۆر** / cîrexor/: ئاوەڵـناو. مووچـەخۆر؛ جیرەهەر؛ جیرەبەر 🇮🇷 حقوق‌بگیر

**جیرەهەر** / cîreher/: ☜ **جیرەخۆر**

**جیڕ**[1] / cîr̄/: نـاو. دیانەکیرە؛ گڕ دیاری دانی ددان ‹ددان لێ جیڕ کردنەوە› 🇮🇷 عمـل دنـدان بـه هـم ساییدن

**جیڕ**[2]: ئاوەڵناو. چیڕ؛ خۆگر و نەپس ‹ئـەو نانـە زۆر جیڕە، ناخورێ› 🇮🇷 جیر

**جیڕ**[3]: دەنگەناو. جیڕە: ١. دەنگی دادڕانی قوماش ٢. دەنگی دەرگای ژەنگاوی لە کردنەوەدا 🇮🇷 ١. صدای پاره شدن پارچه ٢. صدای لولای زنگ‌زده

▣ **جیڕ بونـەوە**: ١. ڕیـچ بوونـەوە ٢. خـۆگر و نەپس بوون ٣. [مەجاز، پلار] تەمەن زۆر بـوون (و نەمردن) ‹سەد سالییە، هەر جیڕ ئەبێتـەوە!› 🇮🇷 ١. دندان بر هـم سـاییدن ٢. مقـاوم شـدن ٣. کهنسال شدن

**جیڕاندن** / cîr̄andin/: چاوگ. تێنەپەڕ. //جیڕانـدت؛ دەجیڕێنی؛ بجیڕێنـە// جیڕە کردن 🇮🇷 جیر ـ جیـر کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەجیڕاندن

**جیڕجیڕک** / cîr̄cîr̄ik/: نـاو. مەشکەدڕە؛ سیسرک؛ سیسرە 🇮🇷 جیرجیرک

**جیڕجیـڕۆک** / cîr̄cîr̄ok/: نـاو. گیایـەکی بـەهاری گـەڵا پانـە وەکـوو تـووتی، دەکرێتـە گـزرە بـۆ ئاژەڵان لە زستاندا 🇮🇷 گیاهی است

**جیڕجیڕەک** / cîr̄cîr̄ek/: ناو. شیڕشیڕە؛ بەرزەچـڕ؛ زیڕزیڕە 🇮🇷 جیرجیرک

**جیـڕدۆ** / cîr̄do/: ئاوەڵـناو. چـڕدۆ؛ تایبەتمەنـدی مانگایەک کە شیر دانـادا 🇮🇷 ویژگـی گـاوی کـه آسان شیر ندهد

**جیڕوهـۆڕ** / cîr̄ û hor̄/: دەنگـەناو. جیڕەجیـڕ؛ دەنگی جیڕەی زۆر 🇮🇷 صدای متوالی جیر- جیر

**جیڕە** / cîr̄e/: ☜ **جیڕ**[3]

**جیڕەجیڕ** / cîr̄ecîr̄/: دەنگ. جیڕوهۆڕ 🇮🇷 جیروویر

**جیز** / cîz/: ناو. گوێز 🇮🇷 گردو

**جیـزە**[1] / cîze/: ناو. چۆلەکەیەکی سـنگ سـپی و

پشت بۆرە ☰ پرندەای است

**جیزە**[۲]: دەنگەناو. گیزە؛ دەنگی زۆر باریکی مێشوولە و سەماوەر و ... ☰ وزوز

**جیزەجیز / cîzecîz**: دەنگەناو. گیزەگیز؛ جیزەی زۆر ☰ وزوز پیاپی

**جیفرک / cîfiřk**: ناو. ١. کاری دەرپەڕین و هەڵاتن ٢. کاری دەرچوون بە جووتە و لووشکەوە ‹لە سەر سم سەما بە جیفرک دان/ بە یادی کەما دایگرتە بەندان «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ ١. عمل جَستن و فرار کردن ٢. جُفتک

⊡ **جیفرک لە خۆ دان**: دەرپەڕین ☰ جَستن و فرار کردن

**جیفنە / cîfne**: ناو. چاوچنۆکی؛ تەماح ☰ طمع

**جیفە / cîfe**: ناو. ١. کەلاک؛ کەلاش؛ لاشەی بۆگەنیو ٢. *[کینایە، پلار]* ماڵی دنیا ‹پیاو کەسێکە بۆ ژیان و جیفە تا ئاخرنەفەس/ نۆکەری شێخ و غولامی بەگلەر و ئاغا نەبێ «موفتی پێنجوێنی»› ☰ ١. لاشەی متعفن ٢. مال و منال

**جیڤک / cîvik**: ناو. چۆلەکە؛ مەلیچک ☰ گُنجشک

**جیق**[۱] **/ cîq**: ناو. *[پلار]* جیق‌وفیق؛ هەناو ☰ امعا و احشا

**جیق**[۲]: دەنگەناو. دەنگی ناچاری لە زۆر بۆ هاتن ☰ جیغ

⊡ **جیق دەرهاتن**: ١. *[پلار]* ناو زگ و هەناو بڵاو بوون ٢. *[مەجاز، پلار]* زۆر بۆ هاتن ‹ئەم لام تات و ئەو لام تات/ وەی بابە جیقم دەرهات! «مەسەل»› ☰ ١. دل و رودە بیرون آمدن ٢. تحت فشار قرار گرفتن

**جیقاندن / cîqandin**: چاوگ. تێپەڕ. //جیقاندت؛ دەجیقێنی؛ بجیقێنە// جیقانن: ١. جیقە کردن ٢. ڕیقنە کردن ☰ ١. جیغ زدن ٢. ریدن پرندە

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەجیقاندن

**جیقانن / cîqanin**: ☜ جیقاندن

**جیقڵ / cîqił**: ناو. جیکڵ؛ چیقڵ؛ چیکڵ؛ دانی هێشتا هەرس‌نەکراو لە جیقڵدانی باڵندەدا ☰ چینە؛ دانەی هضم نشدە در چینەدان مُرغ

**جیقڵدان / cîqiłdan**: ناو. جیکڵدان؛ جیکڵدانە؛ جیقڵدانە؛ جیقەڵدان؛ چیقڵدانە؛ چیکڵدانە؛ چینەدوو؛ جێگەی دانی هەزمنەکراو ☰ چینەدان

**جیقڵدانە / cîqiłdane**: ☜ جیقڵدان

**جیقن / cîqin**: ئاوەڵناو. جیقنە: ١. *[پلار]* جیقە؛ لەڕ و لاوازی کەلەلا کە بە حاڵ نووزەی دێت ٢. جیقەجیق‌کەر ☰ ١. لاغر و مردنی ٢. جیغو

**جیقنە**[۱] **/ cîqne**: ناو. ڕیقن؛ ڕیقنە؛ پیسی باڵندە ☰ فضلەی پرندە

**جیقنە**[۲]: ☜ جیقن

**جیقنەمەل / cîqnemel**: ناو. کەلناس؛ سیق؛ جیقڵدان ☰ چینەدان

**جیق‌وفیق / cîq û fîq**: ☜ جیق[۱]

**جیقۆلە / cîqole**: ناو. زیقاوە ☰ خروس کولی

**جیقە**[۱] **/ cîqe**: ☜ جیقن ـ١

**جیقە**[۲]: دەنگەناو. ١. *[پلار]* دەنگی لاواز لە زۆر بۆ هێنان و ڕێک‌کوشین ٢. جووکە؛ وردە دەنگی مەل ☰ ١. جیغ ضعیف ٢. جیک ـ جیک؛ آواز مُرغان

**جیقەجیق / cîqecîq**: دەنگەناو. ١. جریوە و جووکە ٢. *[پلار]* قیژەقیژ ☰ ١. جیک ـ جیک ٢. جیغوویغ

**جیقەجیق‌کەر / cîqecîqker**: ئاوەڵناو. جیقن؛ جیقنە؛ جیقە؛ لەڕ و لاوازی کەلەلا کە بە حاڵ نووزەی دێت ☰ جیغو

**جیقەسپیلکە / cîqes(i)pîlke**: ناو. ڕیقنەسپیلکە؛ جۆرێ نەخۆشی کوشندەی مریشک و کەڵەباب و فرندەیە ☰ از بیماری‌های پرندگان

**جیقەڵدان / cîqełdan**: ☜ جیقڵدان

**جیقەڵدو / cîqełdû/**: ناو. جیقەڵدان؛ سیکەتۆرە ☰ چینەدان

**جیک[1] / cîk/**: ناو. ١. پانیە؛ پاژنە ٢. چک؛ چکە؛ قوێرە؛ لای قووڵی قاپ ٣. جێگە؛ جێ ☰ ١. پاشنە ٢. طرف گودِ قابِ بازی ٣. جا؛ مکان

**جیک[2]**: دەنگەناو. ١. دەنگی بێچووەمەل ٢. دەنگی چۆلەکە ☰ ١. صدای جوجە ٢. صدای گنجشک

**جیکاندن / cîkandin/**: چاوگ. تێنەپەر. //جیکاندت؛ دەجیکێنی؛ بجیکێنە// جیکانن؛ جکاندن؛ جیکنای؛ جووکەجووک کردن ☰ جیک ـ جیک کردن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەجیکاندن

**جیکانن / cîkanin/**: ☜ جیکاندن

**جیکای / cîkay/**: ☜ جووقان

**جیکجیکە / cîkcîke/**: ناو. شیرشیرە؛ جانەوەرێکی چکۆلەی باڵدارە، لە کوللە دەکا، بە گژوگیاوە دەنیشێ و دەجیکێنێ ☰ زنجره

**جیکڵ / cîkił/**: ☜ جیقڵ

**جیکڵدان / cîkiłdan/**: ☜ جیقڵدان

**جیکڵدانە / cîliłdane/**: ☜ جیقڵدان

**جیکن / cîkin/**: ناوەڵناو. [پلار] کەمسەبری بە بۆڵەبۆڵ ☰ ناشکیبای غرغرو

**جیکنای / cîknay/**: ☜ جیکاندن

**جیکنە / cîkne/**: ناو. ١. کوتکی هەلاجی؛ ئامرازێک کە ژێکەوانی هەلاجی دەلەرێنێتەوە ٢. چیکەنە؛ جیکەنە؛ دۆلابی لۆکە ڕستن ☰ ١. گوشت‌کوب مانند دست نداف ٢. دوک نخ‌ریسی

**جیکە / cîke/**: دەنگ. جووکە؛ دەنگی باریک و نزم ☰ صدای زیر و آرام

⊡ **جیکە بڕین**: [پلار] جووکە بڕین؛ بێدەنگ کردن ☰ خفه کردن

**جیکەجیک / cîkecîk/**: دەنگەناو. دەنگی مەل ☰ آواز مُرغان

**جیکەنە / cîkene/**: ☜ جیکنە

**جیکیای / cîkyay/**: چاوگ. جیکەجیک کردن ☰ جیک ـ جیک کردن

**جیل / cîl/**: ☜ جیر

**جیلا / cîla/**: ناو. جۆلا؛ بووزووکەر؛ شاڵباف ☰ بافندە

**جیلاباف / cîlabaf/**: ☜ جاڵجاڵۆکە

**جیلایی / cîlayî/**: ناو. جۆلایی ☰ بافندگی

**جیلە / cîle/**: ناو. جۆگەلە؛ جۆگەی چکۆلە ☰ جوی باریک

**جیم[1] / cîm/**: ناو. جێ؛ ناوی پیتی شەشەمی ئەلفوبێی زمانی کوردی ☰ جیم

**جیم[2]**: پێرۆ. ← لامەجیم

**جین / cîn/**: ناو. ١. یەکەی بژاردنە، بەرامبەر بە شەش یان دوازدە دانە ‹جینێک میداد بدە!› ٢. پارچەی ئەستوور لە بەن، زۆرتر بۆ شاڵوار و بەرگی کار ٣. ئامێری جیا کردنەوەی ناوکەپەموو لە پەموو ٤. دەستە؛ گرووپ ‹مە خوە کر دوو جین› ☰ ١و٢. جین ٣. وسیلەی جدا کردن پنبەدانە از پنبە ۴. گروە

**جیناڤ / cînav/**: ☜ جێناو

**جیناڤک / cînavik/**: ☜ جێناو

**جینجارۆک / cîncînarok/**: ناو. گوڵی داری هەنار ☰ گل درخت انار

**جینچک / cînçik/**: ناو. جینچکان؛ جینچکە؛ قوونەڵتس؛ کار و ڕەوتی هەڵترووشکان؛ هەڵتووتەکان ☰ چُمباتمە

**جینچکان / cînç(i)kan/**: ☜ جینچك

**جینچکە / cînç(i)ke/**: ☜ جینچك

**جینگز / cîngiz/**: ☜ جینگن

**جینگڵ / cîngił/**: ناو. بزاوی کەم ☰ تکان؛ جم

⊡ **جینگڵ دان**: تەکان خواردن؛ خۆ شەکاندنەوە

‹وەک نۆبەتیدارێکی سەخت، گەرم داهاتم؛ هۆش و حەواسم پێ نەما؛ خەوم لێ نەدەکەوت. شەو لە سەر جێگە هەر جینگلم دەدا... «هەژار، چێشتی مجێور»› ■ جُنبیدن

**جینگن** / cîngin/: ئاوەڵناو. *[پەلار]* شەڕانی؛ جینگز؛ جینگەنە؛ جینگۆکە؛ نەگونجاو ■ ستیزەجو

**جینگۆکە** / cîngoke/: ☜ **جینگن**

**جینگەنە** / cîngene/: ☜ **جینگن**

**جینۆک** / cînok/: ناو. جۆرێ زیپکە و لیر لە پێست ■ نوعی جوش

**جینیات** / cînyat/: ناو. مێرووی وەک ئەسپێ و کێچ ■ حشرات خانگی

**جینێر** / cînêr/: ناو. هاوسا؛ دراوسێ؛ جیران ■ همسایه

**جیو** / cîw/: ناو. ژی؛ ژیان ■ زندگی

**جیوار** / cîwar/: ناو. ١. وار؛ دەڤەر؛ مەڵبەند ٢. ئاکنجی؛ کار و ڕەوتی نیشتەجێ بوون ■ ١. منطقه ٢. اسکان

⊡ **جیوار بون**: نیشتەجێ بوون ■ اسکان یافتن

**جیوار کردن**: نیشەجێ کردن؛ جێ کردن ‹ئەم ب خورتی ل ڤر جیوار کرن› ■ اسکان دادن

**جیواز** / cîwaz/: ناو. جێگۆڕکێ؛ کار و ڕەوتی جێ گۆڕان ■ عمل جابەجا شدن

⊡ **جیواز بون**: گۆڕان؛ جێ گۆڕان ‹شوونەکەم جیواز بووە› ■ عوض شدن

**جیواز کردن**: گۆڕین ‹کی جیوازی مێزەکەم کرد؟› ■ عوض کردن

**جیوە**[1] / cîwe/: ناو. ١. زاوق؛ ژووڤە؛ توخمی کیمیاوی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ٨٠ و کێشی ئەتومی ٢٠٠,٥٩، کە لە دەمای ئاساییدا تراوە و ڕەنگی لە زیو دەکا ٢. ☜ **جەوی** ■ ١. جیوه ٢. ☜ **جەوی**

**جیوە**[2]: دەنگەناو. جرووکە ■ جیک ـ جیک

⊡ **جیوە تێ‌کران**: *[کینایە]* هەدا نەدان و نەحەجمین لە شوێنێک ‹سرەوتنی بۆ نییە، دەڵێی جیوەی تێ کراوە، هەر تاوێ لە شوێنێکە!› ■ آرام و قرار نداشتن

**جیوەجیوە**[1] / cîwecîwe/: ناو. تروووکە و زریوەزریوی ئەستێران ■ سوسوی ستارگان

**جیوەجیوە**[2]: دەنگەناو. دەنگی تیکەڵاوی مەلانی بچووک، بەتایبەت چێشکە ■ صدای درهم پرندگان کوچک، بویژه گُنجشکان

**جیۆتی** / c(i)yotî/: ☜ **جیاتی**

**جیه** / cîh/: ☜ **جێ**[1] ـ١

**جیەڵ** / c(i)yeł/: ☜ **جییەر**

**جیهاد** / cîhad/: ناو. جەهاد؛ خەباتی ئایینی ■ جهاد

**جیهان** / cîhan/: ناو. جەهان؛ دنیا ■ جهان

**جیهانبینی** / cîhanbînî/: ناو. ئایدیۆلۆجی؛ جەهان‌بینی؛ کۆمەڵێک بیر و بڕوا کە دەبێتە سەرچاوە بۆ کار، ئاکار، چالاکی و چاوەڕوانییەکانی تاک و کۆمەڵگای مرۆڤ ■ جهان‌بینی

**جیهوار** / cîhwar/: ناو. جهوار: ١. ☜ **جیوار** ٢. شوێنەوار ‹جیهوارێن کەڤن› ■ ١. ☜ **جیوار** ٢. آثار

**جییەر** / cîyer/: ناو. لەج؛ جیەڵ؛ بەرهەڵستی و پێداگری لە سەر شتێ ■ لج

**جێ**[1] / cê/: ناو. ١. جی؛ جیه؛ جێگە؛ شوێن؛ جیه ٢. دایک؛ دالک ٣. جێوبان ٤. جیم؛ نێوی شەشەمین پیتی ئەلفوبێتکەی زمانی کوردی ■ ١. جا؛ مکان ٢. مادر ٣. رختخواب ٤. جیم؛ نام ششمین حرف الفبای کردی

⊡ **جێ بونەوە**: لە جێگەیەکدا گونجان/ خونجان ■ جا شدن

**جێ خۆش کردن**: بە خاترجەمی لە شوێنێک مانەوە ■ جا خوش کردن

**جێ داگیر کردن**: جێ گرتن؛ جێ تەنگ کـردن ‹ئەم مێزە شکاوە تەنیا جێی داگیر کردووە و هیچ کەڵکی نییە› ≡ جا تنگ کردن

**جێ کردنەوە**: ڕێ کردن: ۱. جـێ بـاز کـردن؛ جێگای پێویست بـۆ خـۆ وەگـیر خسـتن ۲. *[کینایە]* جێی خۆ کردنـەوە؛ وەرگـیردران یـان پەسند کران لە لایەن کەسێ یان تاقمێکـەوە ۳. دڕن دان ≡ ۱تا۳. جا باز کردن

**جێ گرتن**: ۱. جێ دابین کردن ‹لە هۆتێل جێم گرتووە› ۲. جێگیر بـوون ‹لـە شـوێنی خۆیـدا جێی گرت› ۳. ☜ **جێ داگیر کردن** ≡ ۱. جا رزرو کـردن ۲. جـا گـرفتن ۳. ☜ **جـێ داگیـر کردن**

**جێ گرتنەوە**: بوونە جـێگیری کەسـێک ‹دوای سـەرۆک کـێ جێـی دەگرێتـەوە؟› ≡ جانشـین شدن

**جێ مان**: بـەجێمـان؛ دوا کـەوتن؛ لـە دواوە مانەوە ≡ جا ماندن

**جێ هێشتن**: ۱. لە بیر چـوون ۲. نـەهێنان؛ بـە جێ هێشـتن ۳. کەوتنـە بـەر ≡ ۱. فرامـوش کردن ۲. جا گذاشتن ۳. سبقت گرفتن

**بە جێ هێنان**: ۱. جێبەجێ کردن ۲. وێنا کردن؛ ناسینەوە ≡ ۱. انجام دادن ۲. بە جا آوردن

**خستنە جێ**: گرتنەوە؛ بردنـەوە سـەر جێگـەی خۆی ‹دەستم لە جێ چبـوو، خسـتییەوە جـێ› ≡ جا انداختن

**جێ -**[۲]: پێشوشە. شـوێن یـا ئـامرازێ کـە شـتێکی تێدایە یا بۆ شتێکە ‹جـێخـەرمان؛ جـێکـەوش؛ جێپێ؛ جێخەو› ≡ جا -

**- جێ**[۲]: پاشەوشە. جێگا؛ گا ‹خەرمانجێ؛ قـەلاجێ› ≡ جای

**جێئاگر / cê'agir/**: ناو. ئاوردان ≡ آتشدان

**جێئاو / cê'aw/**: ناو. حەوز؛ هۆوز؛ هەود؛ بڕک ≡ حوض

**جێب / cêb/**: ناو. جـێم؛ جێـو؛ گیرفـان؛ بـەرک؛ بەریک ≡ جیب

**جێباوەڕ / cêbawer̄/**: ئاوەڵناو. ۱. جـێمتمانـە؛ ڕاست و ئەمین ۲. شیاوی بڕوا کردن ≡ ۱. مورد اعتماد ۲. قابل باور

**جێباوەڕی / cêbawer̄î/**: ناو. هـورم؛ بـڕ؛ وەج ≡ اعتبار

**جێبڕک / cêbir̄k/**: ☜ **جۆبڕ**

**جێبڕوا / cêbir̄wa/**: ئاوەڵناو. ڕاسـتاڵ؛ ڕاسـاڵ ≡ مورد اعتماد

**جێبەجێ**[۱] **/ cêbecê/**: ناو. جێوەجێ؛ کار و ڕەوتی دامەزران و پێکـهێنان ≡ عملِ انجام یافتن

◘ **جێبەجێ بوون**: ۱. حاوانەوە لە خـانوو یـان لـە ئاواییدا ۲. پێکهاتنی کار ≡ ۱. جاگیر شـدن ۲. انجام شدن

**جێبەجێ کردن**: ۱. پێـکـهێنـان؛ کـار دروسـت کردن ‹کاری مەحموودی هاسان جێبەجێ کـرد و زۆری مەمنوونی خۆی کـرد «هـەژار، چێشـتی مجێور»› ۲. *[کینایە]* گایین ≡ ۱. انجام دادن ۲. گاییدن

**جێبـەجێ**[۲]: ئاوەڵـکار. جێوەجـێ؛ دەسـبـەجێ؛ هەرلەجێ ‹بەجێیـە چونکـە ئـەو هەسـتا، قیامـەت جێبەجێ هەستا/ لە چەرخ ئەمشەو وەکوو ئەشکم لە دیدە، داوەری کەوکەب «مەحوی»› ≡ فوراً

**جێبەجێیی / cêbecêyî/**: ناو. فەسـاڵ؛ ئـەنجام ≡ انجام

**جێبەرز / cêberz/**: ئاوەڵناو. گەپ؛ گەورە؛ گران ≡ بلندپایە

**جێپێ / cêpê/**: ناو. شۆپ؛ شوێن پێ ≡ رد پا

◘ **جێپێ لەق بوون**: جێپێ لێژ بـوون: ۱. *[مەجاز]* کـەم و کـورتی هێنـان (لـە پایـە و مایـەدا) ۲. نەتوانین لـە شـوێنی خـۆدا مانـەوە ≡ ۱. کـم

آوردن (پول یا مقام) ٢. امکان ماندگاری نداشتن

**جێ پێ لێژ بوون**: ☜ **جێ پێ لەق بوون**

**جێ پێ هەڵگرتن**: شوێن گێڕان؛ دانە شۆپ ☰ رد گرفتن

**جێترس** / cêtirs/: ناوەڵناو. بەسام؛ گرتۆڵە؛ سامناک ☰ سهمناک

**جێتەپکە** / cêtepke/: ☜ **جێتەڵە**

**جێتەڵە** / cêtele/: ناو. جێتەپکە؛ جێداو؛ داوگە؛ ئەو شوێنە بۆ ڕاو داوی لێ دەنێنەوە ☰ دامگاه

**جێجلقانە** / cêcilqane/: ناو. وشترحۆ؛ حندرحۆ؛ ئەمسەر و ئەوسەر ☰ الاکُلنگ

**جێجڵقانە** / cêciłqane/: ناو. حندرحۆ؛ سیسۆ؛ ئەمسەر ـ ئەوسەر ☰ الاکُلنگ

**جێچرا** / cêç(i)ra/: ناو. چرادان؛ شوێن یان شتی چرا لە سەر دانان ☰ چراغپایە

**جێچۆڵ** / cêçoł/: ناو. چۆڵایی؛ نزار ☰ خلوتگە؛ جای خالی

**جێخاڵی** / cêxałî/: ناو. شوێنێ کە شتێ یان کەسێکی تێدا نییە ☰ جاخالی

**جێخاڵیانە** / cêxał(i)yane/: ناو. کاری چوونە لای کەس و کاری کەسێکی سەفەرکردوو ☰ دیدار از اطرفیان مسافر

**جێخوون** / cêxûn/: ☜ **جۆخین**

**جێخەرمان** / cêxerman/: ناو. ١. شوێنێ کە بۆ خەرمان دروست کردن بشێ ٢. شوێنی کە پێشتر خەرمان بووە ☰ ١. زمین مناسب خرمن ٢. جایی کە پیشتر خرمنگاه بوده

**جێخەڵووز** / cêxełûz/: ناو. ڕەژیدان؛ خەڵووزدان ☰ زُغالدان

**جێخەو** / cêxew/: ناو. جێگەی نووستن؛ جێڕازان؛ شوێنی هەڵاژیان ☰ خوابگاه

**جێخێز** / cêxêz/: ☜ **جەغز**

**جێدار**[1] / cêdar/: ناو. نوێنەر؛ وەکیل ☰ نماینده

**جێدار**[2]: ناوەڵناو. ١. بە بایەخ؛ هێژا ٢. گونجاو؛ بەجێ؛ بەڕێوجێ ٣. *[کینایە]* خاوەن کوڕ ☰ ١. ارجمند ٢. معقول ٣. دارای پسر

**جێداو** / cêdaw/: ☜ **جێتەڵە**

**جێر** / cêr/: ناو. ژێر؛ ژێل؛ لایێ کە بەرەو خوار یان بەرەو زەوییە ☰ زیر

**جێرک** / cêrik/: ناو. تیسک؛ زەنگەتە تری؛ هێشووی چکۆلە ☰ تلسک انگور

**جێری** / cêrî/: ناو. کلفەت؛ کارەکەر؛ خزمەتکاری ژن لە ماڵدا ☰ کُلفَت؛ خدمتکار

**جێریفک** / cêrîfik/: ☜ **جاڕوو-١**

**جێڕازان** / cêřazan/: ناو. جێخەو؛ جێگەی نووستن ☰ خوابگاه

**جێڕاو** / cêřaw/: ناو. ڕاوگە؛ نێچیرگا؛ نەچیرگ ☰ شکارگاه

**جێڕەڵم** / cêřeł(i)m/: ناو. کەڤیشتن؛ زیخەڵان ☰ ریگزار

**جێز** / cêz/: ناو. جەز؛ خەرمانی سوور؛ خەرمانی ئامادەکراو؛ کۆی خەرمان ☰ خرمن انباشته

**جێزوک** / cêzok/: ناو. جەزیرە؛ جزیرە؛ ئاد ☰ جزیره

**جێژن** / cêjn/: ناو. جەژن؛ جەشن؛ جێژنە؛ جەژنە؛ گێژن؛ گێژنە ☰ جشن

▣ **جێژنی بەرات**: جێژنی شەوی نیوەی مانگی شەعبان ☰ عید شب نیمەی شعبان

**جێژنی بەرانان**: *[باوەڕی کۆن]* جێژن و شادی کاتی بەران تێکردن ☰ جشن و سور بە مناسبت جفتگیری قوچ و گوسفند

**جێژنی پاک**: جێژنی هەستانەوەی مەسیح لای کریستیەنان ☰ عید پاک

**جێژنی ڕەمەزان**: جەژنی ڕۆژوو؛ ڕێکەوتی یەکەمین ڕۆژی مانگی شەوال، بە بۆنەی کۆتایی هاتنی مانگی ڕەمەزانەوە ☰ عید فطر

**جێژنی قوربان:** جێژنی حاجیان؛ جەژنۆ قوربانی؛ جێژنی موسلمانان ڕێکەوتی دەی زیحەجە عید قربان

**جێژنی کریسمەس:** جێژنی لە دایک بوونی حەزرەتی عیسا عید کریسمس

**جێژنی لە دایک بوون:** جێژنی سالەهاتی هاتنە دنیا جشن تولّد

**جێژنی مەولود:** جێژنی لە دایک بوونی پێغەمبەری ئیسلام عید میلاد پیامبر اسلام

**جێژنی میعراج:** ڕۆژی ٢٧ی مانگی ڕەجەب، سەرەتای پێغەمبەریی حەزرەتی موحەممەد عید مبعث

**جێژنی نەتەوەیی:** جێژنی تایبەتی نەتەوەیەک عید ملّی

**جێژنی نەورۆز:** نەورۆز؛ جێژنی بەهار؛ جێژنی سەری سال؛ جێژنی سەرەتای بەهار عید نوروز

⊡ **جێژن گرتن:** بەڕێوە بردنی جێژن جشن گرفتن

**جێژنان** / cêjnan/: ناو. جەژنان؛ ڕۆژانی جەژن روزهای عید

**جێژنانە** / cêjnane/: ناو. جەژنانە؛ خەلاتی جێژن عیدی

**جێژن‌مبارەکی**/ cêjnmimbarekî/: ☜ جێژنەپیرۆزە

**جێژنە** / cêjne/: ☜ جێژن

**جێژنەپیرۆزە** / cêjnepîroze/: ناو. جەژنەپیرۆزە؛ جەژن‌موارەکی؛ جێژنەپیرۆزی؛ جێژن‌ممبارەکی؛ کاری ممبارەک‌بادی کردن بە هۆی جێژنەوە تبریک عید

**جێژنەپیرۆزی** / cêjnepîrozî/: ☜ جێژنەپیرۆزە

**جێ‌ژوان** / cêj(i)wan/: ناو. ژوانگە؛ شوێنی پێک‌گەیشتنی دوو دلدار ‹بۆ پەناسیلە و بن گیشە و جێ‌ژوانی چۆل/ بۆ گراوی و کوڕە حەیرانی که لێک جوێن دەگریم «هێمن»› میعادگاه

**جێڤی** / cêvî/: ئاوەلناو. هەڤزک؛ جمک؛ دوانە دوقلو

**جێ‌قامک** / cêqamik/: ناو. تەپل؛ شوێن‌پەنجە اثر انگشت

**جێ‌قایم** / cêqayim/: ئاوەلناو. پاوەجێ؛ پایەدار پایدار

**جێکل** / cêkil/: ناو. سیقل؛ سیق؛ چینەی هەزم‌نەکراو چینەی هضم‌نشده

**جێکەن** / cêken/: ئاوەلناو. جێگەکەن؛ لەبنەوە دەرهاتوو؛ هەلکنراو زۆرتر بە تەواوەتی یان بۆ هەمیشە ‹دار ئەگەر دار بێ، جێکەن نابێ «مەسەل»› جاکن

**جێ‌کەوتوو** / cêkewtû/: ئاوەلناو. *[سەرزارەکی]* پوخت و کامل ‹پیاوێکی ژیر و جێ‌کەوتووە› جاافتاده

**جێکەوتوویی** / cêkewtûyî/: ناو. شەنگست؛ پرنسیب پرنسیب

**جێگا** / cêga/: ناو. جێگە: ١. جێ؛ شوێن ٢. گورەنگە؛ ئەخەکن؛ جێ دیاریکراو بۆ کەسێ یان شتێک ٣. نوێن؛ جێ‌وبان ١. جا ٢. جایگاه ٣. رختخواب

⊡ **جێگا داخستن:** نوێنی خەو ڕاخستن رختخواب پهن کردن

**جێگر** / cêgir/: ناو. جێگرەوە؛ جێ‌نشین جانشین

**جێگرتو** / cêgirtû/: ئاوەلناو. سەقامگیر؛ بەرقەرار پایدار

**جێگرەوە** / cêg(i)rewe/: ☜ جێگر

**جێ‌گوند** / cêgund/: ناو. دێگە؛ شوێنی دێ جای و اثر دهکده

**جێ‌گۆڕاو** / cêgořaw/: ئاوەلناو. بەرەودوا؛ جێبەجێ پس و پیش

**جێگـۆڕکێ** / cêgořkê/: نـاو. یاگـەواڕێ؛ کـاری گۆڕانی جێگا یان ئاستی شتێ ☲ جابجایی

**جێگە** / cêge/: ناو. جێ؛ جی؛ جێیـە؛ جاگـە؛ جـا؛ شـوێن ‹جێگـەی پـام بکـەرەوە، سـەرم ئاسـانە «مەسەل»› ☲ جا

**جێگەبەجێگە** / cêgebecêge/: ☜ جاوەجا[1]

**جێگەبەنداو** / cêgebendaw/: ناو. وەنگە ☲ جای سد

**جێگەکەن** / cêgeken/: ☜ جێکەن

**جێگـەورە** / cêgewre/: ناوەلـناو. نـەجیبزادە؛ نەجیمزایە؛ بنیچەئەسڵ ☲ نجیب‌زادە

**جێگیر** / cêgîr/: ناوەلناو. ۱. جێگـەگر؛ جاگرتـێ؛ جیـەوەگر؛ بـە بارسـتایی زۆرەوە ۲. سـەقامگیر؛ دامەزراو؛ ئەرەمەرزیا؛ ئاکنجی ☲ ۱و۲. جاگیر

**جێلـەجێ** / cêlecê/: ناوەلـکار. پاوەپـا؛ تاوەتـا؛ پێچەوانە ☲ جابجا

**جێلەوەڕ** / cêleweř/: ناو. لەوەڕگا؛ گیاجاڕ؛ چایەر ☲ مرتع

**جێڵ** / cêł/: ☜ جەحێڵ

**جێم** / cêm/: ☜ جێب

**جێماگ** / cêmag/: ☜ جێماو

**جێماو** / cêmaw/: ناوەلناو. جێمـاگ: ۱. لەگـەڵ خـۆدا نـەهێنراو ۲. بـەجێماو؛ دواکـەوتوو ☲ ۱. جامانده ۲. عقب‌مانده

**جێمتمانـە** / cêmitmane/: ناوەلـناو. ئـەمین؛ جێباوەڕ؛ ڕاست و ئەمین ☲ مورد اعتماد

**جێمک** / cêmik/: ☜ جومڵانە

**جـێن** / cên/: نـاو. *[زیـنناسـی]* ژێـن؛ هۆکـاری ڕاگواستنی دانستەگەلی ڕەگەزی لە کروموزۆمـدا ☲ ژن

**جێناسی** / cênasî/: ناو. تۆپۆلـۆژی؛ کـار و ڕەوتی لێکۆڵـینەوە لـە سـەر شـوێنێک لـە بـواری پێوەندییەکانی لەگەڵ مێژوودا ☲ توپولوژی

**جێناو** / cênaw/: ناو. *[ڕێزمان]* جینـاڤ؛ جیناڤـک؛ ڕاناو؛ هێما بۆ ناو لە ڕێزماندا ☲ ضمیر دستوری

**جێنشین** / cên(i)şîn/: ناو. جێگرەوە ‹جێنشینـی ئەو منم ئەمەوێ/ ئێل بۆ هەوارگەی کوێسـتان سـەر کەوێ «پیرەمێرد»› ☲ جانشین

**جێنـەتیک** / cênetîk/: نـاو. *[زیـنناسـی]* ژێنێتیـک؛ زانستێ کە لە سەر دیاردەکانی میراتی ڕەگـەزی دەکۆڵێتەوە ☲ ژنتیک

**جێنـەڕاتۆڕ** / cênеřatoř/: نـاو. ژێنراتـۆر؛ دینـەمۆ؛ موەلید؛ مەکینەی بەرهەمهێنی وزەی کارەبـا ☲ ژنراتور

**جێنیاز** / cên(i)yaz/: ناو. ڕووگە؛ قیبلـە؛ شـوێنی نزا و نیاز ‹خودایەکی بێنیـاز و جـێنیـازە «هـەژار، *قورئان*»› ☲ قبلەی حاجات

**جێنیـک** / cênîk/: نـاو. مـووی لاجانـگ ☲ مـوی بناگوش

**جێو** / cêw/: ☜ جێب

**جێوان** / cêwan/: ☜ جێوبان

**جێوبـات** / cêwbat/: نـاو. پێخـەف؛ سـەرناز؛ جێگەوبان ☲ رختخواب

**جێوبـان** / cêwban/: نـاو. جێـوان؛ پێخـەف؛ ئەسپابی نووستن ☲ رختخواب

**جێوبڕ** / cêwbiř/: ناو. گیرفانبڕ؛ بەرکبڕ؛ کیسەبڕ ☲ جیب‌بُر

**جێوک** / cêwik/: ☜ جومڵانە

**جێوەجێ** / cêwecê/: ☜ جێبەجێ

**جێوەلەک** / cêwelek/: ناوەلناو. سووک و چرووک؛ هەرزە ☲ هرزه

**جێهک** / cêhik/: ناو. هۆکەر؛ زەرف لە ڕێزمانـدا ☲ ظرف در دستور زبان

**جێهەناسە** / cêhenase/: نـاو. سـی؛ فتـدان ☲ ریه

**جێیە** / cêye/: ☜ جێگە

# چ

**چ / ç/**: پیت. نیشانەی حەوتەمین پیتی ئەلفوبێی زمانی کوردی چ

**چ[1] / çi/**: ناو. پیتی حەوتـەمی ئـەلفوبێـی زمـانی کوردی چ؛ هفتمین حرف الفبای کُردی

**چ[2]**: ئاوەڵناو. ١. بۆ دەربڕینی چۆنیەتییەکی سەیر و سەمەرە ‹چ ڕێکەوتێ! چ قسـەیەک!؛ چ کانییـەک!› ٢. چۆن؛ بۆ پرسیار لە شتێ یان چۆنیەتییەک ‹بە چ کارێکەوە خەریکی؟ چ گۆرانییەکت پـێ خۆشـە؟› ٣. کام؛ پرسیار بۆ ناسینەوە ‹ئەوڕۆ چ ڕۆژێکە؟› ١. چە؛ عجب ٢و٣. چە

**چ[3]**: ئاوەڵکار. چەنـدە ‹ئـازاد چ جـوان دەنووسـێ؛ چ خۆشە› چقدر؛ چە

**چ[4]**: جێناو. *[سواوە]* ١. چـی؛ نیشـانەی پرسـیار کـە دەگەڵ کارێکدا دێ ‹چ دەنووسێ؟ بۆ چ کەسـێ؟› ٢. هیچ؛ هیچ شت ‹چ ناخوا؛ چم نییە› ١. چـە؛ چە چیز ٢. هیچ؛ هیچ چیز

**چ[5]**: ئامراز. ١. بۆ بەرامبەری دوو لایەن ‹چ شیرین و چ تاڵ؛ چ بخۆی چ نـەخۆی› ٢. هەم ‹چ مـن چ تـۆ چاکمان دەزانی وا نییە› ١. چە؛ خواه ٢. هم؛ چە

**چ[6]**: پێشوشە. هیچ ‹چ جاران› هیچ

**چا[1] / ça/**: ناو. ١. چیا؛ کێو؛ کەژ ٢. بـیر؛ چـاڵ ٣. چای؛ چایی ‹هەرکە چای پێ چـا نـەبوو، پێـت چـا نەبێ! «مەسەل»› ١. کوه ٢. چاه ٣. چای

**چا[2]**: ئاوەڵناو. چاک؛ باش؛ خـاس: ١. پێچەوانـەی خراپ ‹هەرکە چای پێ چا نـەبوو، پێـت چـا نـەبێ! «مەسەل»› ٢. ساغ؛ ساق؛ پێچەوانەی نەخۆش ‹ـ زۆر نەخۆشم. ـ چـا دەبی ئیشەڵـلا› ١. خـوب ٢. سلامت

▣ **چا بون** ☜ **چاك بون**

**چا بونەوە** ☜ **چاك بونەوە**

**چا کردنەوە/ کرنەوە** ☜ **چاك کردنەوە**

**چا[3]**: سارستە. *[کنایە]* چـاو؛ تماشـا ‹چـا ئـازاد چـۆن هەڵدێ› بنگر؛ نگاه کُن

**چا[4]**: ئامراز.جە؛ ئا؛ لەو از آن

**چابک / çabik/**: ئاوەڵناو. چابوک؛ چاپک؛ چەلەنگ؛ ئازا؛ چوست؛ زرینگ؛ مـەزبووت ‹کـوردێکم دەوێ چابک و پتەو/ سەفەرێـک هـەیـە بـۆم بکـا بـە شـەو «هەژار، *بۆ کوردستان*»› چابک

**چابوغ / çabuğ/**: نـاو. ١. تەختە زەوینی سێگۆشە ٢. گرۆڵ؛ پارچەی سێسووچی بنقۆڵـی کـەوا ١. قطعه زمین مثلثی شکل ٢. سەگوش زیر بغل قبا

**چابوک / çabuk/**: ☜ **چابك**

**چابوغ / çabûğ/**: ناو. سنوور؛ کەوشەن مرز

**چاپ / çap/**: نـاو. ١. پیشە و زانـینی لێگرتنـەوەی پەرتووک و وێنە و... لە هەژماری زۆردا بە ئـامراز و کەرەستەی تایبەت بۆ ئەو کارە ‹پیشەی چـاپ›

٢. کار و ڕەوتی لێگرتنەوە لە نووسراوە یان وێنە بە پیتی چاپی یان پەڕەی هەستۆک و گواستنەوەیان بۆ سەر کاغەز، مەقەوا، پلاستیک و... بە دەزگای چاپ ‹چاپی کتێب؛ چاپی پارچە› ٣. کار و ڕەوتی گواستنەوەی وێنەی فیلم بۆ سەر کاغەز بە لێدانی تیشک، بۆ دەرهێنانی وێنە ‹چاپی وێنە› ٤. سەرجەمی نوسخەگەلی کتێبێک لە یەک‌جار چاپدا ‹چاپی یەکەم› ٥. *[کینایە]* درۆ؛ هەڵبەستە ٦. پیاڵەیەک بۆ پێوانە ٧. شەقڵی خەرمان ≡ ١تا۴. چاپ ۵. دروغ ۶. نوعی پیمانه ۷. مُهر خرمن

⊡ **چاپ بوون:** لە چاپ دران ≡ به چاپ رسیدن

**چاپ کردن:** ١. لە چاپ دان ٢. *[کینایە]* بافیش و درۆ کردن ≡ ١. چاپ کردن ٢. لاف زدن

**چاپ لێدان:** *[کینایە]* شات‌وشووت کردن؛ درۆ هەڵبەستن ≡ لاف زدن

**چوونە ژێر چاپ:** دەسپێکردنی چاپی شتێک ≡ زیر چاپ رفتن

**لە چاپ دران:** ☜ **چاپ بوون**

**چاپاڵێو** / çapałêw/: ناو. چایی‌پاڵێو؛ چایی‌پارزن؛ تڵتەگیر؛ تۆڕێکی بچووکە تڵتەی چایی دەگرێ ≡ چای‌صاف‌کن

**چاپان** / çapan/: ناو. ١. بارست؛ ئەنازە ٢. جاو؛ خام ≡ ١. اندازه ٢. کرباس

**چاپاندن** / çapandin/: چاوگ. چاپ کردن؛ لە چاپ دان ‹فەرهەنگا زمانێ کوردی هاتە چاپاندن› ≡ چاپخانەدار

**چاپانەسەرێ** / çapaneserê/: ناو. گیایەکی وەک کەرتەشییە، بەڵام بێ‌دڕوو ≡ گیاهی است

**چاپانی** / çapanî/: ☜ **چارپانی**

**چاپباز** / çapbaz/: ناوەڵناو. *[کینایە]* درۆزن؛ بە فڕ و فیشاڵ؛ درۆباز ≡ لافزن

**چاپچی** / çapçî/: ناو. ١. ئەوەی لە چاپخانە کار دەکا ٢. *[کینایە]* درۆزن؛ بافیش‌کەر ≡ ١. چاپچی ٢. لافزن

**چاپخانە** / çapxane/: ناو. مەزرەکە؛ شوێنێ بە کەرستە و ئامێری پێویست بۆ لە چاپ دانی کتێب و ... ≡ چاپخانه

**چاپخانەدار** / çapxanedar/: ناو. مەزرەکەدار؛ خاوەن چاپخانە ≡ چاپخانەدار

**چاپک** / çapik/: ☜ **چابك**

**چاپکسوار**[1] / çapiks(i)war/: ناو. کەسێ کە ئەسب بۆ خەڵک ڕادەهێنێ ≡ مُربی پرورش اسب

**چاپکسوار**[2]: ناوەڵناو. شۆڕەسوار؛ سوارچاک؛ سووکەسوار؛ سووکەڵەسوار؛ سوارخاس؛ خاوەن لێهاتوویی لە ئەسپ‌سواری و لنگاردانی ئەسپدا ≡ چابکسوار

**چاپکە** / çapke/: ناو. دەفری ماست تێدا هەوێن کردن ≡ ظرف ماست‌بندی

**چاپکەر** / çapker/: ناو. چاپگەر: ١. ئەوی کتێب چاپ دەکا ٢. پرینتێر؛ کەرەستەی چاپ کردن ≡ ١. کسی که چاپ می‌کند ٢. چاپگر

**چاپکی** / çap(i)kî/: ناو. تەڕدەستی ≡ چالاکی

**چاپگەر** / çapger/: ☜ **چاپکەر**

**چاپوچووپ** / çap û çûp/: ناو. چاپ‌وگووپ؛ شات‌وشووت ≡ لاف‌وگزاف

**چاپوچەپاو** / çap û çepaw/: ناو. تالان و بڕۆ ‹تووران فەرار بین وە حاڵ خراو / ئێران بەنا کەرد وە چاپ و چەپاو «شانامەی کوردی»› ≡ تاراج؛ یغما

**چاپوگووپ** / çap û gûp/: ☜ **چاپوچووپ**

**چاپەز** / çapez/: ناو. ١. کەسێ کە چای لێدەنێ ٢. قۆری چای لێنان ٣. سەماوەر ≡ ١. چایچی ٢. قوری ٣. سماور

**چاپەمەنی** / çapemenî/: (!) ناو. بەڵاڤۆک؛ ئەو شتانەی لە چاپ دەردەچن ≡ مطبوعات

**چات**[1] / çat/: ناو. ١. پارچە پەڕۆی کۆنە ٢. شریتی

تفەنگ پا کردنەوە ≡ ١. کُهنه؛ لت پارچه ٢. نوار پاک کردن تُفنگ

⊡ **چات کردن:** ☜ **چاك کردن ـ٤**

**چات**[٢]: ئاوەڵناو. زل؛ گوشاد ‹بارام دەڤ چاتە› ≡ گُشاد

**چاتکێش** / çatkêş/: ناو. ئامرازی تفەنگ پا کردنەوە کە شریتی لێدەهاڵێنن ≡ ابزاری برای پاک کردن تفنگ

**چاتمە** / çatme/: ناو. ١. کاری پێکهەڵپەساردنی تفەنگان لە کاتی وچاندا ٢. کێشکچی؛ پێشدار؛ نیابان ≡ ١. چاتمه ٢. قراول

**چاتۆڵ** / çatoł/: ناو. ١. داهۆڵ؛ داوەڵ ٢. چاتۆڵە؛ خێوەتی تەنکی هاوینە ≡ ١. مترسک ٢. خیمەی نازک تابستانی

**چاتۆڵە** / çatołe/: ☜ **چاتۆڵ ـ٢**

**چاتەڕێ** / çateřê/: ناو. چەندڕێیان ≡ چندراهی

**چاچک** / çaçik/: ناو. بنێشت؛ جاچکە ≡ سقَز

**چاچکە** / çaçke/: ناو. جاچکە؛ وێژەن؛ بنێشت؛ داچکە ≡ سقَز

**چاچۆلە** / çaçole/: ناو. چاچۆڵ؛ چاچۆڵە: ١. فێڵ؛ شلتاغ؛ دەبە؛ تەشقەڵە؛ گەڕ ٢. تەلیسم؛ شتێ کە هێزێکی نەناسراوی تێدا خەیاڵ بکرێ ≡ ١. شلتاق ٢. طلسم

**چاچۆڵ** / çaçoł/: ☜ **چاچۆلە**

**چاچۆڵباز** / çaçołbaz/: ئاوەڵناو. چاچۆڵەباز؛ فێڵباز؛ گزیکار ≡ حُقّهباز

**چاچۆڵگەر** / çaçołger/: ناو. چاچۆڵوان: ١. جادووگەر؛ جادووباز ٢. فێڵباز ≡ ١. جادوگر ٢. حقهباز

**چاچۆڵوان** / çaçołwan/: ☜ **چاچۆڵگەر**

**چاچۆڵە** / çaçołe/: ☜ **چاچۆلە**

**چاچۆڵەباز** / çaçołebaz/: ☜ **چاچۆڵباز**

**چاچەقوڵێ** / çaçequlê/: ناو. ١. چێشتی منداڵان ٢. چێشتی بە دزی گەورەی ماڵ لە پێشخان ≡ ١. دستپخت بچەها ٢. خوراک ویژەی پنهانی

**چاچی** / çaçî/: ☜ **چایچی**

**چاخ**[١] / çax/: ناو. ١. کات؛ وەخت؛ زەمان ‹هەر تا چاخ فەسڵ نەو وەهار شیا/ دەنگ ناڵەمان نە چەمەن بیا «بێسارانی»› ٢. چەک؛ پەڕەی چاپی پارە وەرگرتن لە بانک ٣. قەباڵەی ملک ≡ ١. وقت؛ زمان ٢. چک ٣. سند مالکیت

**چاخ**[٢]: ئاوەڵناو. ١. قەڵەو؛ گۆشتن ‹گەیشت بە پۆلێ مریشکی زۆر چاخ/ هەموو هێلکەکەر، هەموو بەدەماخ «قانع»› ٢. ساز و بەکەیف ‹ماوام گەرمەسێر ئەگەر لێلاخەن/ دەماخم وە بۆی هەوای تۆ چاخەن «جەهان ئارا»› ٣. ساز و تەیار ‹قلیانێ چاخ کە!› ≡ ١. چاق ٢. شاد و سرحال ٣. فراهم؛ آماده

⊡ **چاخ کردن:** ساز/ تەیار/ بەرهەڤ کردن ‹سەبیلەکە چاخ کە!› ≡ چاق کردن

**چاخ و لەڕ کردنەوە:** [کینایە] چاوەڕوان کردن و نەکردن؛ هەواڵی چاک دان و بە هیچ دەرچوون ≡ شاد و پشیمان کردن

**چاخەو کردن:** قەڵەو کردن؛ چاخ کردنەوە ≡ پروار کردن

**چاخان**[١] / çaxan/: ناو. درۆ؛ فشە. هەروەها: **چاخان کردن** ≡ لاف

**چاخان**[٢]: ئاوەڵناو. درۆزن؛ بە شاتوشووت ≡ لافزن

**چاخانباز** / çaxanbaz/: ☜ **چاخانچی**

**چاخانپاخان** / çaxanpaxan/: ☜ **چاخانوپاخان**

**چاخانچی** / çaxançî/: ئاوەڵناو. چاخانباز؛ درۆزن ≡ چاخانچی

**چاخانوپاخان**/ çaxan û paxan/: ناو. چاخانپاخان؛ شاتوشووت؛ درۆ و دەلەسە ≡ لافوگزاف

**چاخانە** / çaxane/: ☜ **چایخانه**

**چاخ ،چاخ** / çax çax/: ئاوەڵکار. جارنەجار؛ جاروبارە؛ جار ـ جار ≡ گاهگاه

**چاخشور / çaxşûr**/: ناو. ناوی گیایەکی دەشتەکی ترشە ☰ گیاهی است

**چاخمو / çaxmû**/: ئاوەڵناو. قایم؛ پتەو ☰ محکم

**چاخمور / çaxmûr**/: ☜ **چەخمور**

**چاخمە / çaxme**/: ناو. گەوی گچکەی کانزایی کونی قایشە پشتێند ☰ حلقەی کوچک فلزی سوراخ کمربند

**چاخوچل / çax û çil**/: ئاوەڵناو. گردەڵی قەڵەو ☰ چاق و چله

**چاخۆر / çaxor**/: ☜ **چاییخۆر**

**چاخی / çaxî**/: ناو. قەڵەوی ☰ چاقی

**چادان / çadan**/: ناو. قۆری؛ چاپەز ☰ قوری

**چادر / çadir**/: ناو. چار؛ خێوەت؛ ڕەشماڵ؛ تاوڵ؛ کۆن ☰ چادر

◘ **چادر پێچانەوە**: /کینایە/ کۆ کردنەوە ☰ جمع کردن بساط

**چادر هەڵدان**: خێوەت هەڵدان؛ هەڵکردنی ڕەشماڵ بۆ تێدا هێورین ☰ چادر زدن

**چادرک / çadirk**/: ناو. بەرهەڵبێنە ☰ پیشبند

**چادرنشین / çadirnişîn**/: ئاوەڵناو. ڕەوەن؛ ڕەوەند؛ زەوەند؛ کۆن‌نشین؛ چایرنشین؛ چۆڵ‌نشین؛ هۆبەنشین؛ ڕەشماڵ‌نشین؛ کۆچەر؛ خێڵەکی؛ چۆڵپەرست؛ هەواری؛ هۆبەیی؛ هۆبەیێ؛ گەرمێن و کوێستان‌کەر؛ خاوەن ژیانی کۆچەرایەتی. هەروەها: **چادرنشینی** ☰ چادرنشین

**چار[1] / çar**/: ناو. ۱. ڕووبەندی ژنانە ۲. دەرەتان؛ چارە ‹چاری دلۆپە، پێش باران ئەکرێ› ۳. ☜ **چوار** ٤. دەسرۆکەی نیشانەی بووکێنی ٥. بیچم؛ دەموچاو ٦. ☜ **چادر** ۷. دەرەقەت؛ دەرۆست ۸. تەمێ؛ کار و ڕەوتی ژێر کردن ☰ ۱. روبند ۲. چاره؛ علاج ۳. ☜ **چوار** ۴. دستمال عروس ۵. سیما ۶. ☜ **چادر** ۷. وضع یا شرایط حریف کسی یا چیزی شدن ۸. تنبیه

◘ **چار کردن**: ۱. تەمێ کردن ۲. دەرەقەت هاتن؛ لە عۆدە هاتن ☰ ۱. حساب کسی را رسیدن ۲. از پس کسی/ چیزی برآمدن

**چار هاتن**: ڕێچارێ هەبوون ‹بە شیوەن چاری کاری ئێمە نایە/ خەبات کەڵکی نییە مامە خەمانە «هێمن»› ☰ راه حل داشتن

**چار[2]**: ئاوەڵناو. ۱. ☜ **چوار[2]** ۲. ڕەشی نێو چاوان سپی (بزن) ۳. ڕەشی گوێ سپی (مەڕ) ٤. ڕەش (مەڕ) ☰ ۱. ☜ **چوار[2]** ۲. سیاه پیشانی سفید (بُز) ۳. سیاه و سفیدگوش (گوسفند) ۴. سیاه (گوسفند)

**چاران / çaran**/: چاوگ. تێپەڕ. //چارای؛ دەچارێ؛ بچارێ// بەڕێوە بردن؛ چەرخاندن ‹کە تەسلیمی سێحر و تەلیسمی بنارن/ بەبێ هەوڵی هەڵدان و چارانی چارن «سوارە»› ☰ اداره کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: چاراو/ چاوگی نەرێنی: نەچاران

**چارانچەقیلە / çarançeqîle**/: ناو. چارەچەقیلە؛ چارانەچەقیلە؛ ڕەبەنۆک؛ خاشخاشک ☰ نوعی خشخاش

**چارانە / çarane**/: ناو. /کۆن/ چوارئاوێنە؛ جلکێکی شەڕکەران بووە ☰ چهارآیینه

**چارانەچەقیلە / çaraneçeqîle**/: ☜ **چارانچەقیلە**

**چاربەری / çarberî**/: ناو. بزنی چوار ساڵە ☰ بُز چهار ساله

**چارپا / çarpa**/: ☜ **چەرپا**

**چارپانی / çarpanî**/: ناو. چاپانی؛ جۆرێ هەڵپەڕکێ ☰ نوعی رقص

**چارپایە / çarpaye**/: ☜ **چەرپا**

**چارپل / çarpil**/: ☜ **چەرپا**

**چارپێ / çarpê**/: ☜ **چوارپێ**

**چارپێچی / çarpêçî**/: ☜ **چەرچی**

**چارت / çart**/: ناو. نوانە، بەتایبەت نوانەی پێکهاتەی دامەزراوەیەک ☰ چارت

**چارتیکانێ / çartîkanê/:** ☜ **چوارمەشقان**

**چار چار / çar çar/:** ناو. چوار ڕۆژی ئاخری چلەی چووکە ≚ چهار روز آخر چلّەی زمستان

**چارچـاڤ**[1] **/ çarçav/:** ناوەڵناو. چارچەش؛ سەرلێشێواو ≚ سرگردان

**چارچـاڤ**[2]**:** ناوەڵکار. [کینایە] چارچەش؛ بە وشیارییەوە ≚ چهارچشمی؛ با دقّت

**چارچم / çarçim/:** ☜ **چوارچێوە ـ١**

**چارچمبل / çarçimbil/:** ناو. چوارهەنگڵ؛ کووپەی چواردەسک ≚ خُم چهار دسته

**چارچو / çarçû/:** ☜ **چوارچێوە**

**چارچەش / çarçeş/:** ☜ **چارچاڤ**

**چارچەڤ / çarçev/:** ناو. چارشێو ≚ چادر زنان

**چارچەقلی / çarçeqlî/:** ناوەڵکار. خرمچـوون؛ چوارپەل ≚ چهاردست‌وپا

**چارچەک / çarçek/:** ناوەڵناو. پرچەک؛ شەڕڤان ≚ مُسلّح

**چارچی / çarçî/:** ناو. جەرەبادەری چوارسووچ ≚ پیچ‌گوشتی چهارسو

**چارچیق / çarçîq/:** ناو. زەوینی زۆنگ ≚ زمین باتلاقی

**چارچێوە / çarçêwe/:** ☜ **چوارچێوە**

**چارخانە / çarxane/:** ☜ **چوارخانە**

**چارداخ / çardax/:** ناو. کونگی؛ دیوارۆکەی نەوی بۆ مالات تێکردن ≚ حصار کوتاه گلی دام

**چاردارە / çardare/:** ناو. تابووت؛ داربەست ≚ تابوت

**چارداغ / çardağ/:** ناو. چەرداخ؛ چەرداغ؛ کۆخی ناو بێستان و مەزرا ≚ کرچە؛ کلبە

**چارداوەڕوو / çardaweřû/:** ناوەڵناو. [مەجاز] چەرداوەڕوو؛ بێشەرم ≚ بی‌شرم

**چاردە / çarde/:** ☜ **چواردە**

**چاردەساڵ / çardesał/:** ناو. چارکەوت؛ چواروەرز ≚ چهار فصل

**چارڕێک / çařêk/:** ☜ **چوارڕێیان**

**چارشا / çarşa/:** ناو. داهاتوو ≚ آینده

**چارشو / çarşo/:** ☜ **چارشێو**

**چارشەم / çarşem/:** ☜ **چوارشەممە**

**چارشەمب / çarşemb/:** ☜ **چوارشەممە**

**چارشەمبۆ / çarşembo/:** ☜ **چوارشەممە**

**چارشەمبی / çarşembî/:** ☜ **چوارشەممە**

**چارشەمۆ / çarşemo/:** ☜ **چوارشەممە**

**چارشەو / çarşew/:** ☜ **چارشێو**

**چارشێو / çarşêw/:** ناو. چارشۆ؛ چارشەو: ١. چایر؛ هیزار؛ هیراو؛ جۆرێ پۆشەنی ژنانی موسڵمان کە سەر تا پا دادەپۆشێ ‹چارشێو سفیدان چون قورس قەمەر/ پەخشان بین جە سەر سەوزەی دەشت و دەر «شێخ عیماد مەردۆخی»› ٢. مەوج؛ ئەو جاجمەی نوێنی تێوە دەپێچن ‹پاییز زەڕ یەخ جام چارشێوێ هەی تەم/ دێرەن سوارەن نەوعەرووس خەم «مەولەوی»› ≚ ١. چادر زنان ٢. جاجیم

**چارشێودۆلاخی / çarşêwdołaxî/:** ناوەڵناو. خاوەن هەر دوو چارشێو و دۆلاخ ‹تا بەر لە پاشایەتی پەهلەوی ژنانی ئێرانی چارشێودۆلاخی بوون› ≚ چادرچاقچوری

**چارشێوشان / çarşêwşan/:** ناو. چارۆکە ≚ رودوشی زنانە

**چارشێونوێن / çarşêwn(i)wên/:** ناو. مەوج؛ جاجم ≚ جاجیم

**چارشێوی / çarşêwî/:** ناوەڵناو. ١. لەبار بۆ چارشێو ٢. چارشێو بە سەر ≚ ١و٢. چادُری

**چارقەڵەمباز / çarqełembaz/:** ناوەڵناو. [کینایە] چوارپەل سپی (ئەسپ) ≚ چهار دست و پا سفید (اسب)

**چارک / çarik/:** ناو. ١. برینگ ٢. چواریەک ≚ ١. قیچی پشم‌زنی ٢. چارک؛ ربع

**چارکولۆڵ / çarkułoł**/: ناوەڵناو. ئەنی ڕەش و گوێ سپی (پەز) ☰ پیشانی سیاه گوش‌سفید (گوسفند)

**چارکە / çarke**/: ☜ **چالک**

**چارکەوت / çarkewt**/: ناو. چاردەساڵ؛ چواروەرز ☰ چهار فصل

**چارگاڤ / çargav**/: ☜ **چوارناڵ**

**چارگاڤی / çargavî**/: ☜ **چوارناڵ**

**چارگۆشە / çargoşe**/: ناو. چوارسووچ ☰ مربع

**چارلەبک / çarlebik**/: ناو. چوارپەل؛ چوار دەست و پێ ☰ چهار دست و پا

**چارلەپ / çarlep**/: ☜ **چارلەپك**

**چارلەپک / çarlep(i)k**/: ناوەڵکار. چارلەپ؛ چوارپەل؛ گاگۆلکێ؛ چواردەست و پێ ‹زارۆک بە چارلەپکێ دلڤن› ☰ چهار دست و پا

**چارماک / çarmak**/: ناو. چوار ماکی سەرەکی (ئاو، ئاگر، با، خاک) ☰ چهار عُنصر

**چارمەشقە / çarmeşqe**/: ☜ **چوارمەشقان**

**چارمەکوک / çarmekûk**/: ناو. جۆرێ بووزوو ☰ نوعی شال

**چارمێرکی / çarmêrkî**/: ☜ **چوارمەشقان**

**چاروا / çarwa**/: ناو. چاروە؛ چاروێ؛ چارەوا؛ چارەوێ: ۱. ئەوی لە سەر چواردەست و پێ دەڕوا ۲. ئەسپ و ماین ☰ ۱. چهارپا ۲. اسب و مادیان

**چاروادار / çarwadar**/: ناو. چاروەدار؛ چاروێدار؛ چەروەدار؛ چارەوێدار؛ ولاخدار؛ کەسێ کە بارەبەر بە کرێ دەدا ☰ کسی که چهارپا را کرایه می‌دهد

**چاروە / çarwe**/: ناو. ۱. زنج؛ چەقەوانە کە دە پەنجە دەکرێ ۲. ☜ **چاروا** ☰ ۱. سنج ۲. ☜ **چاروا**

**چاروەدار / çarwedar**/: ☜ **چاروادار**

**چاروێ / çarwê**/: ☜ **چاروا**

**چاروێدار / çarwêdar**/: ☜ **چاروادار**

**چارۆخ / çarox**/: ناو. جۆرێ پاپۆشێ وەک کاڵەیە ☰ چارُق

**چارۆک / çarok**/: ☜ **چارۆکە ـ۱**

**چارۆکە / çaroke**/: ناو. ۱. چارۆک؛ چارەکە؛ چارەگە؛ قوماشێ کە ژنان بە سەر شانیدا دەدەن ۲. گیایەکە ۳. *[کینایە]* پەزدان؛ منالدان ☰ ۱. رودوشی زنانه ۲. گیاهی است ۳. زهدان

**چارە / çare**/: ناو. ۱. بیچم؛ سەروسیما ۲. بەخت؛ شانس ‹فەریاد جە شۆرەی ئەرز چارەی من/ هەر سەوزەی موراد من نادیارەن «مەولەوی»› ۳. بەرەج؛ هاوڵ؛ هاویل؛ گوزوور؛ ئفنای؛ دەوەرە؛ ڕێ چارە بۆ ڕزگار بوون لە ڕووداوێکی ناخۆش یان دۆخێکی نالەبار ٤. ڕێکار؛ ڕێچار؛ دەرەتان ‹چارەی ئەم دەردە لە لای قالاوە/ گەرچی زۆر پیرە بە لاوی ماوە «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ ۱. چهره ۲. شانس ۳. چاره ۴. راه حل

▣ **چارە کردن**: ڕێچارێ دۆزینەوە ☰ راه حل یافتن

**چارەچەقیلە / çareçeqîle**/: ☜ **چارانچەقیلە**

**چارەخواز / çarex(i)waz**/: ناوەڵناو. خوازیاری دۆزینەوەی چارە. هەروەها: **چارەخوازی** ☰ چاره‌جو

**چارەدۆزی / çaredozî**/: ناو. دەبر؛ کار و ڕەوتی چارەسەر دۆزین. هەروەها: **چارەدۆز** ☰ چاره‌اندیشی

**چارەڕەش / çareřeş**/: ناوەڵناو. کلۆڵ؛ بەدبەخت ‹قەت لە دنیادا نەبوو بێجگە لە ناخۆشی بەشم/ مات و داماو و پەشێو و بێکەس و چارەڕەشم «هێمن»›. هەروەها: **چارەڕەشی** ☰ بدبخت؛ سیاه‌بخت

**چارەساز / çaresaz**/: ناوەڵناو. چارەسەرکەر؛ بە توانایی یان ئەگەری چارەسەر کردن. هەروەها: **چارەسازی** ☰ چاره‌ساز

**چارەسەر / çareser**/: ناو. دەرەتان؛ ڕێی نەجات ☰ راه حل؛ علاج

▣ **چارەسەر کردن**: ١. چارە کردن ٢. دەرمان کردن 🇮🇷 ١. برطرف ساختن ٢. درمان کردن

**چارەسەرکەر** / çareserker/: ☜ **چارەساز**

**چارەسەری** / çareserî/: ناو. کار و ڕەوتی چارەسەر کردن؛ ڕزگار کردن لە ڕووداویکی ناخۆش یان دۆخێکی نالەبار 🇮🇷 کارسازی

**چارەشڵ** / çareşił/: ئاوەڵناو. سوورکەڵەی نمووس 🇮🇷 سُرخ‌روی ککمکی

**چارەک** / çarek/: ناو. چارەگ؛ چاری؛ چاریک: ١. چواریەک؛ بەشێ لە چوار بەشی شتێ ‹هاوار بە مالم چیمان پێ کرا/ لە چارەکێکا سەدمان لێ خرا «بێکەس»› ٢. یەکەی پێوانە بەرانبەر بە یەک بەش لە چوار بەشی گەزێ (٢٥ سانت) ٣. یەکەی کێشانە بەرامبەر بە ١٠ سیر (٧٥٠ گرەم) ٤. بەشێ لە چواربەشی ئاجۆر 🇮🇷 ١. رُبع ٢و٣. چارک ۴. یک چهارم آجر

**چارەکە** / çareke/: ناو. ١. ☜ **چارۆکە ـ١** ٢. قوماشێ چوارسووچ بۆ تۆشە تێدا پێچانەوە 🇮🇷 ١. ☜ **چارۆکە ـ١** ٢. بُقچه

**چارەگ** / çareg/: ☜ **چارەك**

**چارەگران** / çareg(i)ran/: ئاوەڵناو. خوێنتاڵ؛ ڕەزاگران 🇮🇷 گوشت‌تلخ

**چارەگە** / çarege/: ☜ **چارۆکە ـ١**

**چارەنویس** / çaren(i)wîs/: ☜ **چارەنوس**

**چارەنووس** / çarenûs/: ناو. چارەنویس؛ خوانووس؛ سەرنڤووس؛ یازی: ١. بەخت و هات؛ قسمەت؛ سەرجەمی ڕووداوانی ژیان ‹بۆ مەگەر هەژار دەردی یەک و دووانە؟ خوا نەکا مەینەت و چارەنووسی ڕەش، ڕێگای دڵێک و تەوێڵێک بدۆزێتەوە «سوارە»› ٢. ئاکام؛ ئاخر و برانەوەی ژیانی گیانداریک، بەتایبەت مرۆ، یان چۆنیەتی ڕەوتێک ‹ئەو داماوە تووشی چارەنووسێکی خراپ هات› 🇮🇷 ١و٢. سرنوشت

**چارەنووسساز** / çarenûssaz/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* خاوەنی دەوری سەرەکی لە پێکهێنان و بەدیهێنانی ژیانی داهاتوودا 🇮🇷 سرنوشت‌ساز

**چارەنەماو** / çarenemaw/: ئاوەڵناو. بێ‌دەرەتان 🇮🇷 درمانده

**چارەوا** / çarewa/: ☜ **چاروا**

**چارەوێ** / çarewê/: ☜ **چاروا**

**چارەوێدار** / çarewêdar/: ☜ **چاروادار**

**چاری** / çarî/: ☜ **چارەك**

**چاریار** / çaryar/: ناو. جێژنێکی ئەهلی حەقە 🇮🇷 از اعیاد یارسان

**چاریچی** / çarîçî/: ☜ **چەرچی**

**چاریک** / çarîk/: ☜ **چارەك**

**چارین**[1] / çarîn/: چاوگ. چاران؛ سازان ‹چاک هەر وایە لە ناچاری تا هەل و دەرفەت دەرەخسێ بە هەژاریمان بچارین ... «هەژار، *هەنبانە بۆرینە*»› 🇮🇷 ساختن

**چارین**[2]: ☜ **چوارینە**

**چاری‌ناچار** / çarînaçar/: ئاوەڵکار. ناچار؛ لە ناچاری؛ خوایی‌ناخوایی ‹چاری‌ناچار هەڵمانپێچایەوە و ڕۆیشتین و چیتریش نەگەڕاینەوە «زەبیحی»› 🇮🇷 ناگزیر

**چارینچک** / çarînçik/: ئاوەڵناو. چوارگۆشە 🇮🇷 چهارگوشه

**چارینە** / çarîne/: ☜ **چوارینە**

**چارینی** / çarînî/: ☜ **چوارینە**

**چارێز** / çařêz/: ناو. چاییدان ‹چاوت چارێزی چایی/ بۆ خۆم دەتبەم بۆ شایی «فولکلۆر»› 🇮🇷 قوطی چای

**چازان** / çazan/: ئاوەڵناو. ڕێبین؛ ڕێزان؛ خاوەن مشوور 🇮🇷 چارەگر؛ چارەساز

**چازانی** / çazanî/: ناو. پسپۆڕی؛ هۆزان لە کارێکا 🇮🇷 خبرگی؛ تخصص

**چازو / çazû/**: ئاوەڵناو. چاژوو؛ فێڵباز؛ گەڕساز؛ گزیکار ☰ حیله‌گر

**چازوگەر / çazûger/**: ئاوەڵناو. جادووگەر؛ فێڵەباز ☰ حقه‌باز

**چاژ / çaj/**: ☜ **چێژ**

**چاژو / çajû/**: ☜ **چازو**

**چاسر / çasir/**: ناو. ١. گوێسوانە؛ پاسارەی بان ٢. سوالکەر؛ دەرۆزە؛ پارسەکی ماڵانگەڕ ☰ ١. لبه‌ی بام ٢. گدا

**چاش[1] / çaş/**: ☜ **چێژ**

**چاش[2]**: ئاوەڵناو. شاش؛ سەرگەردان؛ پەشێواو ☰ سرگردان

⊡ **چاش بون**: سەر لێشێوان؛ شپرز بوون ☰ سرگردان شدن

**چاشاندن / çaşandin/**: ☜ **چەشتن**

**چاشاندی / çaşandî/**: ئاوەڵناو. فێرکراو؛ ڕاهاتوو ☰ تعلیم‌دیده

**چاشت / çaşt/**: ناو. ١. چێشتەنگاو؛ قاوەڵتوون؛ کاتی ناوەڕاستی بەیانی و نیوەڕۆ ٢. نانی قاوەڵتوون ☰ ١. چاشت ٢. چاشتانه

**چاشتانە / çaştane/**: ناو. ژەمی چاشت ☰ وعده‌ی چاشتگاه

**چاشتی / çaştî/**: ئامراز. چەشنی؛ لە گوێن؛ وەکوو؛ لە ڕەنگی ☰ همانند

**چاشتێنگا / çaştênga/**: ناو. چێشتەنگاو؛ کاتی نێوان بەیان و نیمەڕۆ ☰ چاشت

**چاشنی / çaşnî/**: ناو. ١. تام؛ چێژ؛ ئەوەی بۆ تام خۆش کردن دە نێو چێشتی دەکەن ٢. چەشنی؛ تورەقە ☰ ١. چاشنی غذا ٢. چاشنی گلوله

**چاشیدەر / çaşîder/**: ناو. فێرکەر؛ ڕاهێنەر ☰ آموزش دهنده

**چاشین / çaşîn/**: چاوگ. فێر بوون ☰ یاد گرفتن

**چاغ و بەنگ / çağ û beng/**: ناو. فریو؛ فێڵ؛ گزی ☰ فریب

**چافک / çafik/**: ناو. جۆرێ کوانی بە بلۆق ☰ دمُل تاول‌زده

**چافکەر / çafker/**: ئاوەڵناو. چاوپیس ☰ شورچشم

**چاڤ / çav/**: ناو. چاو؛ دیدە؛ دیە؛ چەم ☰ چشم

⊡ **چاڤ دان**: چاودێری کردن؛ هۆش پێوە بوون؛ ئاگا لێبوون ☰ مُراقبت کردن

**چاڤ دانان**: *[مەجاز]* چاودەبەری کرن؛ منەت کێشان ☰ منّت کشیدن

**چاڤ شکاندن**: *[مەجاز]* چاو داگرتن؛ بە گۆشەی چاو هێما کردن ☰ چشمک زدن

**چاڤ گرتن**: چاو پۆشین؛ بووردن؛ ویەردن ☰ چشم پوشیدن

**چاڤ لێکرن**: لاسا کردنەوە ☰ تقلید کردن

**چاڤا / çava/**: ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. چۆن؛ چلۆن؛ کوو ☰ چگونه؛ چطور

**چاڤبرچی / çavbirçî/**: ☜ **چاوبرسی**

**چاڤبرسی / çavbirsî/**: ☜ **چاوبرسی**

**چاڤبەلوق / çavbeloq/**: ئاوەڵناو. چاوبۆق؛ چاودەرپەڕیو ☰ چشم‌برجسته

**چاڤ‌پارسەک / çavparsek/**: ئاوەڵناو. فریودەر ☰ فریبنده

**چاڤتاری[1] / çavtarî/**: ناو. چاوکزی ☰ کم‌سویی چشم

**چاڤتاری[2]**: ئاوەڵناو. *[کینایی]* چرووک؛ چکووس؛ ڕژد؛ دەس‌قووچاو؛ نان‌نەخۆر ☰ خسیس

**چاڤتەنگ / çavteng/**: ئاوەڵناو. *[کینایی]* ڕژد؛ چاوبرسی ☰ خسیس

**چاڤتێر / çavtêr/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* بوودە؛ بێ‌نیاز ☰ بی‌نیاز

**چاڤچنۆک / çavç(i)nok/**: ☜ **چاوچنۆك**

**چاڤچەرینگ / çavçerîng/**: ئاوەڵناو. چاوحیز؛ چاوچلێس ☰ نظرباز

**چاڤدزەکێ / çavd(i)zekê/**: ناو. کاری بۆ هەل و دەرفەت ڕوانین ☰ فرصت‌طلبی

**چاڤدێر / çavdêr/**: ☜ **چاودێر**

**چاڤدێری / çavdêrî/**: ☜ **چاودێری**

**چاڤری / çavrî/**: ناو. چارەوێ؛ ڕەشەولاخ؛ ولاخەبەرزە ☰ چهارپا

**چاڤڕەشۆک / çavřeşok/**: ناو. گیایەکە بە گەلای زۆر جوان و ڕەنگاوڕەنگەوە ☰ حُسن‌یوسف

**چاڤڕێ / çavřê/**: ☜ **چاوەڕوان**

**چاڤزەق / çavzeq/**: ☜ **چاوزەق**

**چاڤزێلک / çavzêlik/**: ئاوەڵناو. تامەزرۆی زانین ☰ مشتاق دانستن

**چاڤزێلکی / çavzêl(i)kî/**: ناو. مەراق؛ بالکێشی؛ ئیشتیا و شەوقی زانین ☰ اشتیاق دانستن

**چاڤسست / çavsist/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ١. ترسەنۆک؛ بێ‌غیرەت ٢. بێ‌ئابڕوو ☰ ١. ترسو ٢. بی‌آبرو

**چاڤسۆر / çavsor/**: ☜ **چاوسور**

**چاڤشۆڕ / çavşoř/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* فهێتکار؛ فەدیکار؛ شەرمەزار؛ خەجالەت ☰ شرمنده

**چاڤشەیتانۆک / çavşeytanok/**: ناو. چاوشارەکێ ☰ قایم‌باشک

**چاڤڤەکری / çavvek(i)rî/**: ئاوەڵناو. *[کینایی]* ١. چاوکراوە؛ تێگەیشتوو ٢. دلاوا؛ بەخشندە ☰ ١. آگاه ٢. دست‌ودلباز

**چاڤک / çavik/**: ☜ **چاویلکە ـ١**

**چاڤکز / çavkiz/**: ئاوەڵناو. چاوپرووش ☰ با چشمانی بیمار

**چاڤکلدایی / çavkildayî/**: ئاوەڵناو. چاوبەکل ☰ با چشمان سُرمه کشیده

**چاڤکوسکانێ / çavkuskanê/**: ناو. کار و ڕەوتی بە زەقی ڕوانین؛ زەق چاو تێبڕین ☰ عمل خیره نگریستن

**چاڤکولی / çavkulî/**: ☜ **چاوئێشە**

**چاڤکور / çavkûr/**: ئاوەڵناو. *[کینایی]* چاوبرسی ☰ خسیس

**چاڤکەرۆک / çavkerok/**: ناو. چاولێکەر ☰ مُقلِّد

**چاڤکی / çav(i)kî/**: ☜ **چاویلکەیی**

**چاڤگرتی / çavgirtî/**: ئاوەڵناو. چاونەکراوە ☰ چشم‌بسته

**چاڤگری / çavg(i)rî/**: ☜ **چاوپۆشی**

**چاڤگرێدای / çavg(i)rêday/**: ئاوەڵکار. چاوبەستە؛ چاوبەسراو ☰ چشم‌بسته

**چاڤگە / çavge/**: ناو. ١. دەستەچیلە؛ کەرستەی سەرەتایی بۆ ئاگر هەڵکردن ٢. *[ڕێزمان]* چاوگ؛ مەسدەر ☰ ١. افروزه ٢. مصدر

**چاڤلدەر / çavlider/**: ئاوەڵناو. ١. چاوزەق ٢. *[کینایی]* چاوحیز و ژنباز ☰ ١. چشم‌برآمده ٢. هیز

**چاڤلێدەر / çavlêder/**: ☜ **چاڤهاڤێژ**

**چاڤمار / çavmar/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* چاوتیژ؛ چاوڕوون ☰ تیزبین

**چاڤماسی / çavmasî/**: ناو. گیایەکە ☰ گیاهی است

**چاڤنەرم / çavnerm/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* تایبەتمەندی ژنی خۆ زوو بە دەستەوە دە ☰ ویژگی زنی که می‌شگند

**چاڤنهێر / çavn(i)hêr/**: ☜ **چاوەڕوان**

**چاڤنێر / çavnêr/**: ☜ **چاوەڕوان**

**چاڤنێری / çavnêrî/**: ☜ **چاوەڕوانی**

**چاڤۆک / çavok/**: ناو. بەرچاوکەی ئەسپ ☰ چشم‌بند اسب

**چاڤەگا / çavega/**: ناو. گیایەکە ☰ گیاهی است

**چاڤهاڤێژ / çavhavêj/**: ئاوەڵناو. *[بارەوەری کۆن]* چاڤ‌لێدەر ☰ چشم‌زخم‌زن

**چاڤهەولی / çavhewlî/**: ناو. خێلی؛ خوێلی ☰ لوچی

**چاڤهیشک / çavhîşk/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* بێ‌چاووڕوو؛ بێ‌شەرم و شوورەیی ☰ پررو؛ بی‌شرم

**چاڤینۆک** / çavînok/: ناوەڵناو. *[مەجاز]* ١. چاونەزێر؛ بەئێرەیی ٢. چاوپیس ☰ ١. حسود ٢. شورچشم

**چاڤێر** / çavêr/: ☜ **چاودێر**

**چاڤێری** / çavêrî/: ☜ **چاودێری**

**چاق**[1] / çaq/: ناو. لاق؛ پاق؛ لینگ ☰ لِنگ؛ پا

**چاق**[2]: ناوەڵناو. قەڵەو؛ تێرگۆشت ☰ چاق

**چاقا** / çaqa/: ناوەڵکار. لەو ساوە؛ لە چاخێکەوە؛ لەو دەمەوە ☰ از آن هنگام

**چاقۆ** / çaqo/: ناو. چەقۆ؛ کێر؛ کێرد ☰ چاقو

**چاک**[1] / çak/: ناو. ١. داوێن ٢. قەڵش؛ دەرز؛ درز ٣. گۆڕی پیرۆزی چاکان ☰ ١. دامن ٢. شکاف؛ درز ٣. مزار

⊡ **چاک بەلادا کردن**: *[کینایە]* داوێن بە لادا کردن؛ شاقەل هەڵازنین؛ لێبڕان بۆ جێبەجێ کردنی کارێک ☰ کمر همّت به کاری بستن

**چاک**[2]: ناوەڵناو. چا: ١. باش؛ خاس؛ قەنج ٢. ساغ؛ ساق ☰ ١. خوب ٢. سالم

⊡ **چاک بوون**: چا بوون: ١. لە نەخۆشی هەستان ٢. باش بوون لە دوای خراپە کردن ٣. باش بوون؛ خاس بوون ‹زۆر چاکە› ٤. باش بوون؛ بەکار بوون ‹شتێکی چاکە› ☰ ١. شفا یافتن ٢. درستکار شدن ٣. خوب بودن ۴. مناسب بودن

**چاک بوونەوە**: چا بوونەوە؛ خوەشەو بوون ☰ شفا یافتن

**چاک کردن**: ١. خاس کردن؛ کاری باش و بەجێ کردن ‹چاکت کرد نەهاتی› ٢. لێکدراو یان شکاو ساز کردنەوە ‹شکابوو، دام چاکیان کرد› ٣. سەر و ڕیش دروست کردن ‹بڕۆ سەرت چاک کە!› ٤. چات کردن؛ پەڕاندن؛ نێر هاویشتنە سەر مێ ☰ ١. خوب کردن ٢. مرمت کردن ٣. اصلاح کردن ۴. جفت کردن نر بر ماده

**چاک کردنەوە**: چا کردنەوە/ کرنەوە؛ دروست کردنەوەی لێکدراو یان شکاو ‹چاکیان چاک کردەوە› ☰ تعمیر کردن

**چاک هێنان**: ١. جەخت هێنان؛ دوو جار پشمین ٢. لە یاریدا مۆرە یان بەڵگەی باش هێنان ٣. *[کینایە]* لە سەر شانس بوون ☰ ١. جخت آوردن ٢. آس آوردن ٣. شانس آوردن

**چاک**[3]: ناوەڵکار. خاس؛ باش ‹چاکت لێدا› ☰ خوب

**ـ چاک**[4]: پاشەوشە. خاس؛ باش ‹جوانچاک؛ سوارچاک› ☰ ـ خوب

**چاکبین** / çakbîn/: ناوەڵناو. *[کینایی]* دڵڕوون؛ هزرباش ☰ خوشبین

**چاکخواز** / çakx(i)waz/: ناو. خوازیاری چاکەسازی، بەتایبەت لە دۆخی سیاسی، کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەوە ☰ اصلاح‌طلب

**چاکخوازانە** / çakx(i)wazane/: ناو. پێوەندیدار یان سەر بە چاکەخوازی ☰ اصلاح‌طلبانە

**چاکسازی** / çaksazî/: ناو. ١. کار و ڕەوتی چاک کردنەوە ٢. ئەو کارانە وا بۆ چاکترکردنی باردۆخی کۆمەڵایەتی، ئابووری و ڕامیاری دەکرێ ☰ ١. اصلاح ٢. اصلاحات

**چاکل** / çakil/: ناو. کەڵەوە؛ کەڵەوانە؛ کەڵەم؛ ئاڵقەی دارینی ملی گا و گاگێرە ☰ چنبرەی گردن گاو

**چاکلا** / çakla/: ناو. چێولیباسی؛ جلاویز؛ ئامرازێکە لە چێو یا ئاسن جلوبەرگی پێوە هەڵدەواسن ☰ چوبرختی

**چاکلە** / çakle/: ناو. چاتۆڵ؛ داهۆڵ ☰ مترسک

**چاکلێت** / çaklêt/: ☜ **شوکلات**

**چاکڵ** / çakił/: ناو. چاکڵە: ١. ئاڵقەی سەری گوریس کە کاتی بەستنەوەی شتێک ئەو سەرەکەی لێوە دەردەکەن و دەیکێشن سفت دەبێتەوە ٢. تیکە چێوی دووفلیقانەی سەر گوریس یان تیر و کەوان و ... ☰ ١. وهنگ ٢. تکە چوب دوشاخەی سر طناب و ...

**چاکڵە** / çakłe/: ☜ **چاکڵ**

**چاکمە** / çakme/: ناو. ئابڵۆقە؛ گەمارۆ ☰ مُحاصره

**چاکوپیر** / çak û pîr/: ناو. گۆڕی زیارەتگا ‹سەد چاکوپیرت بۆ دەخولێمەوە/ لە بن سێبەرت بحەسێمەوە «هەژار، *ئاڵەکۆک*»› ☰ مزار

**چاکوچ** / çakuç/: ☜ **چەکوچ**

**چاکوچۆنی** / çak û çonî/: ☜ **چاکوخۆشی**

**چاکوخراپ** / çak û x(i)rab/: ناوەڵناو. پاکوپیس؛ ڕندوکرێت ☰ نیک و بد

**چاکوخۆشی** / çak û xoşî/: ناو. چاکوچۆنی؛ کار و ڕەوتی لە حاڵ و هەواڵ پرسین ‹چاکوخۆشی لەگەڵ ئەستێران کرد/ کەوتە خۆ و بووکی زەمینی جوان کرد «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ احوالپرسی

**چاکە** / çake/: ناو. خاسی ‹ئێمە قەت حەز لە شەڕ ناکەین/ بە هیوای خوێندن و چاکەین «پیرەمێرد»› ☰ خوبی

⊡ **چاکە لەگەڵ کەسێ کردن**: خاسی بۆ کەسێ کردن ☰ در حق کسی خوبی کردن

**چاکەت** / çaket/: ناو. کوت؛ چەشنێ پۆشەن کە لە پێشەوە بە دوگمە دەبەسرێ و زۆرتر ئاستەڕ، قۆڵ و گیرفانی هەیە ‹کە تۆ دەرپێت فڕێ دا و چاکەتی چاکت دەبەر خۆ کرد/ ئەمن شەرمم بە خۆ و شاییم بە خۆمە، جل‌شڕ و کوردم «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ کُت

**چاکەخواز** / çakex(i)waz/: ناوەڵناو. خوازیاری چاکسازی. هەروەها: **چاکەخوازی** ☰ اصلاح‌طلب

**چاکەکار** / çakekar/: ناوەڵناو. خێرومەند؛ ئەهلی کاری چاکە. هەروەها: **چاکەکاری** ☰ نیکوکار

**چاکەل** / çakel/: ناو. چاکەڵ؛ شاقەل؛ لاداوێن ☰ حاشیەی دامن

**چاکەلەسەر** / çakeleser/: ناوەڵناو. بەرمنەت؛ منەتبار؛ مەمنوون ☰ زیرمنّت

**چاکەڵ** / çakeł/: ☜ **چاکەل**

**چاکەن** / çaken/: ناو. بیرکەن؛ قومەشکەن ☰ چاه‌کن

**چاکی** / çakî/: ناو. باشی؛ پەسندی ‹ئەوین نەفسی ژیانە؛ جوانییە، چاکییە، خۆ بەخت‌کردنە، ڕەنج‌کێشان و لەگەڵ دەردا جووت‌بوونە «سوارە»› ☰ خوبی؛ نیکی

**چاکێتی** / çakêtî/: ناو. چاکە؛ باشی ☰ نیکویی

**چاگە** / çage/: ناوەڵکار. دەوێدەرێ؛ لەوێدا ☰ در آنجا

**چاگێڕ** / cageř/: ناو. چاییگێڕ؛ ئەو کەسەی چایی بۆ میوانان دێنێ ☰ چای‌گردان

**چاڵ**[1] / çal/: ناو. جەواڵ؛ جواڵ ☰ جوال

**چاڵ**[2]: ناوەڵناو. سەرسپی (بزن) ☰ پیشانی سفید (بُز)

**چالاغ**[1] / çalağ/: ناو. دارێکی درێژە گەمیەوان لەنگەری گەمیەی پێ دەگرێ ☰ چوب مخصوص لنگر گرفتن قایق

**چالاغ**[2]: ناوەڵناو. چەمووش؛ تووش؛ ڕەوەک؛ سرک؛ سڵ ☰ چموش

**چالاڤ** / çalav/: ☜ **چالاو**

**چالاک**[1] / çalak/: ناو. تێکۆشەر؛ خەباتگێڕ؛ ئەو کەسەی لە بوارێکدا هەوڵ دەدا ‹چالاکی سیاسی› ☰ فعال

**چالاک**[2]: ناوەڵناو. چوست؛ مەزبووت؛ بەکار؛ لەش‌سووک ‹لە گڵۆپ چاتر بەرز و ڕووناکی/ لە پێشکەوتنا سوارێ چالاکی «قانع»› ☰ چالاک

**چالاکانە** / çalakane/: ناوەڵکار. تێکۆشەرانە؛ کارکۆیانە؛ بە چالاکییەوە ☰ فعّالانه

**چالاکە** / çalake/: ☜ **چالک**

**چالاکی** / çalakî/: ناو. کارکۆیی ١. دۆخ یان چۆنیەتی کارا بوون ٢. کار و ڕەوتی پەرژان بە کارێکەوە ☰ ١و٢. فعّالیت

**چالخەم** / çalxem/: ناو. چەقەڵماست؛ ماستاو ☰ دوغ چربی نگرفته

**چالک** / çalik/: ناو. ١. دەسکوسندۆڵ؛ دینگ بۆ

چەڵتووک کوتان ٢. ☜ چالگ ☰ ١. دنگ؛ ابزار شلتوک‌کوبی ٢. ☜ چالگ

**چالگ / çalig/:** ناو. چوالوو؛ چاله؛ چالوو؛ چالەکە؛ چارکە؛ چالک؛ چالاکە؛ چالەک؛ چوارلوو؛ کوڕەبەش؛ کوربەشک؛ تڕی؛ گۆڕنەباش؛ بەتکەبەش؛ وشەک؛ قوڕەبەشە؛ گیانەوەری گوانداری شەوگەڕە بە لەشێکی پان و پۆڕ و قورس، قەپۆزی باریک، چنگ و پەلی تیژ و تیسکی درێژی خۆڵەمێشییەوە، لە مووەکەی فلچە دروست دەکەن ☰ گورکن

**چالو / çalû/:** ☜ چالگ

**چالوک / çalûk/:** ناو. تەنگز؛ تنگز؛ چالووک؛ چالۆک ☰ تنگرس

**چاله / çale/:** ☜ چالگ

**چالەک / çalek/:** ☜ چالگ

**چالەکە / çaleke/:** ☜ چالگ

**چاڵ[1] / çał/:** ناو. ١. قووڵگە؛ چاوانە؛ کەند ٢. قووڵکەی گەورە بۆ دەغڵ و بەفر ☰ ١و٢. چاه

▣ **چاڵی چەنە:** کۆرت؛ کووری ئەرزینگ؛ کۆرتا زەنی؛ قووڵایی ناوەڕاستی چەناگە ☰ چاه زنخدان

▣ **چاڵ کەندن:** کەندنی زەوی بۆ مەبەستێک ☰ چاله کندن

**کردنە چاڵ:** لە چاڵ نان؛ نانە چاڵ؛ نیان؛ ناشتن؛ کردنە ژێر خاکەوە ☰ چال کردن

**لە چاڵ نان:** ☜ کردنە چاڵ

**نانە چاڵ:** ☜ کردنە چاڵ

**چاڵ[2]:** ئاوەڵناو. ١. قوپاو؛ ڕۆچوو ٢. نێو چاوان سپی (ئەسپ) ☰ ١. گود؛ فرورفته ٢. پیشانی سفید (اسب)

▣ **چاڵ بون:** قووڵ بوون ☰ گود شدن

**چاڵ کردن:** قووڵ کردن؛ کوورانـدن؛ کەندنی زەوی تا قووڵ دەبێ ☰ گود کردن

**چاڵ[3]:** پێرۆ. ← چیلکەوچاڵ

**چاڵان / çałan/:** ناو. چاڵێن؛ ماتێن؛ هەڵماتێن؛ پلان؛ کەلامێشان؛ مێشێن؛ کاری کەللا دە قولکە خستن بۆ گەمە ☰ از انواع گردوبازی

**چاڵاو / çaław/:** ناو. چالاڤ؛ بیر؛ چای ئاو «گەلێک جاران لە چاڵاوی ڕەش کەوتم/ هاتمە دەرێ، هەدام نەدا، نەسرەوتم «هێمن»» ☰ چاه آب

**چاڵایی / çałayî/:** ناو. قووڵکە؛ ڕۆچواوی زەمین ☰ گودی

**چاڵبێستان / çałbêstan/:** ناو. دێراو؛ کەردوو ☰ کرت

**چاڵبێش / çałbêş/:** ئاوەڵناو. سەر و پا سپی (ئاژاڵ) ☰ سر و پا سفید (بز و گوسفند)

**چاڵتینگ / çatînig/:** ناو. قووڵکی بەر مل ☰ گودی جلو گردن

**چاڵ ـ چاڵ / çał çał/:** ئاوەڵناو. قووڵکە ـ قووڵکە ☰ پرچاله‌چوله

**چاڵمە / çałme/:** ناو. ١. کیسە توتن ٢. سەعاتێ کە وە خەبەر دەکات ☰ ١. کیسەی توتون ٢. ساعت شماطه‌دار

**چاڵوبلۆق / çał û b(i)loq/:** ☜ چاڵوچۆڵ

**چاڵوچۆڵ / çał û çoł/:** ناو. چاڵوبلۆق؛ زەوینی پڕ لە قووڵکە؛ زەمینی نارێک و ناساف ☰ زمین ناهموار و پُرچاله‌چوله

**چاڵ و زەقێن / çał û zeqên/:** ناو. کایەیەکە بە دوگمە دەکرێ وەک شێر و خەت وایە ☰ نوعی بازی با دگمه شیر و خط

**چاڵوێنەک / çałwênek/:** ناو. چاڵەوێن؛ قووڵکەی سواغ‌دراو بۆ ئاو تێدا خواردنەوەی سەگ ☰ گودال آبخوری سگ

**چاڵۆک / çałok/:** ☜ چالوک

**چاڵوک / çałûk/:** ناو. داروو‌کەیەکی دڕکاوی سپییە بۆ تەندوور و ئاگر دە کار دێ ☰ سفیدخار

**چاڵەبەفر / çałebefr/:** ☜ بەفرەچاڵ

**چاڵەپیرۆشک / çałepîroşk/**: ناو. قووڵکە پیرۆشک ☰ چالەی خرخاکی

**چاڵەقوتە / çałequte/**: ناو. مات؛ قووڵکەی چکۆلە بۆ هەڵماتێن ☰ گودال کوچک تیلەبازی

**چاڵەوێن / çałewên/**: ☜ **چاڵوێنەك**

**چاڵی / çałî/**: ناو. ١. قـووڵایی ٢. قوپـاوی ☰ ١. گودی ٢. فرورفتگی

**چاڵێن / çałên/**: ☜ **چاڵان**

**چام / çam/**: ناو. ١. چـۆرتم؛ بـەلا ٢. قووڵـکە و بەرزایی سەر ڕێگە ٣. خواری و پێچ ٤. داری کاج ٥. چەپەرێکی سێ گۆشە بۆ جۆماڵ کـردن ☰ ١. بلا؛ مُصیبت ٢. پستی و بلنـدی راه ٣. پـیچ و خـم ۴. درخت کاج ۵. ابزاری برای لایروبی

**چام ـ چام / çam çam/**: ناوەڵناو. ١. بەکەند و لەند ٢. بەپێچ و خوارەکە و پێچەکـە ☰ ١. نـاهموار ٢. پرپیچ‌وخم

**چامە / çame/**: ناو. هەڵبەست؛ هۆنراوە ☰ چکامە

**چامـەڕەش / çameřeş/**: نـاو. بـــەلای گـــەورە ☰ مُصیبت بزرگ

**چان / çan/**: ناو. ١. ئامرازێکە بۆ گێـرەی کلـۆش؛ باگوردێنی لە دار بە دارێکەوە دەبەستن و دە ملی گای دەکەن، باگردانەکان بە سەر کلۆشـدا دێـن وردی دەکەن ٢. جەنجەڕ؛ ئامرازی لە دار و ئاسن بۆ گێرە کردنی کلـۆش ٣. ئـامرازی جۆمـاڵ لـە چەپەر؛ شتێکی سێ سووچە لە شـووڵ چنـدراوە وەک بێڵ دەچێ، پرەپووش و لیتەی جۆگەی پێ دەماڵن ٤. زیل؛ زەنگۆڵەی خەبەردار کردن ☰ ١. جَوَن ٢. چرخ خرمنکوب ٣. لجن‌روب دستی ۴. زنگوله

**چانتە / çante/**: ناو. باهۆڵ؛ باوەڵە؛ باول؛ جانتـا ☰ ساک؛ چمدان

**چانچگ / çançig/**: ☜ **چانچیلك**

**چانچیلـک / çançîlik/**: نـاو. قابلەمـــە؛ قاولەمـــە؛ چانچگ ☰ قابلمه

**چانـد / çand/**: نـاو. چانـــدە: ١. خوێنـــدەواری؛ ڕۆشنبیری ٢. کەلتوور؛ فەرهـەنگ ☰ ١. سـواد ٢. فرهنگ

**چاندراو / çand(i)raw/**: ☜ **چێندراو**

**چاندگە / çandge/**: کۆزمـان؛ کـۆڕی زانیـاری ☰ فرهنگستان

**چانـدن / çandin/**: چـاوگ. چـــانن: ١. تـــۆ بـــە زەوییەوە کـردن ‹چـی بچـێنی ئـەوە ئەدووریتـەوە «مەسەل»› ٢. چەقاندنی شەتڵ و نەمام ☰ ١. بذر افشاندن ٢. نهال کاشتن

**چانـدنی / çand(i)nî/**: ناوەڵـناو. چێنـراو؛ شـیاوی چاندن ☰ کاشتنی

**چاندە / çande/**: ☜ **چاند**

**چانقوش / çanqûş/**: نـاو. جـانکووش؛ چـانکووش؛ مجێوری کلیسا ☰ خادم کلیسا

**چـانکۆچ / çankoç/**: نـاو. کـــاری ڕاوەشـــاندنی زەنگۆڵە بۆ کاروان کـە وەخـتی کۆچـە ☰ عمـل نواختن زنگ کاروان به نشانه‌ی رفتن

**چانکوش / çankûş/**: ☜ **چانقوش**

**چانن / çanin/**: ☜ **چاندن**

**چانـە / çane/**: نـاو. گەسـکی لـە شـووڵ بـۆ بـن خەرمان ماڵین ☰ جاروی خرمن

**چاو / çaw/**: ناو. ١. چاڤ؛ چەو؛ چەوە؛ چەم؛ چیم؛ چیەم؛ چێم؛ چەعڤ؛ چەهڤ؛ چەش؛ دیدە؛ دیـە؛ تیە؛ واتوورە؛ ئەندامی بینایی گیانداران ٢. *[مەجاز]* هێزی تێگەیشـتن و زانـین ‹چـاوی دڵ› ٣. نـوا؛ کاری ڕوانین ‹بـە چاوێـک دیـتن› ٤. *[ڕووەکناسی]* چاوکـە؛ چـووزەرە؛ قولـکەیەکی چکۆلـەی سـەر ڕیشە و لاسکی بـڕێ گیـا کـە چەکـەرە دەکـا و دەبێتە ئەنـدامێکی تـازە ٥. ئـەوەی وەک چـاوە ‹چاوی گێژاو› ٦. هـەواڵ؛ دەنگـۆ ‹ئـەوەی چـاوی مـەرگت دا، چـاوی مـەرگی بـدرێ› ٧. پارەیـەکی مغووڵەکان ☰ ١تا۵. چشم ۶. خبـر ۷. نـوعی پـول

مغولی

▣ **چاوی بادامی:** چاوی لە چەشنی بایەم، باریک و کێشراو ⇆ چشم بادامی

**چاوی باز:** ☜ **چاوی کەژاڵ**

**چاوی بۆق:** چاوی پۆق/ زاق/ بۆقری/ دەرپەڕیو ⇆ چشم باباغوری

**چاوی بۆقری:** ☜ **چاوی بۆق**

**چاوی بەزە:** *[کینایە]* ڕوانینی دلسۆزانە ⇆ نگاه ترحُم‌آمیز

**چاوی بینا:** *[کینایە]* چاوێ کە چاک خراپ لێک هەڵاوێرێ ⇆ چشم بصیرت

**چاوی پۆق:** ☜ **چاوی بۆق**

**چاوی پیس:** ☜ **چاوی خراپ**

**چاوی تەڕ:** چاوی فرمێسکاوی/ گریاناوی/ ئاوتێزاو ⇆ چشم تر

**چاوی تەڕ و سوور:** چاوی سوور هەڵگەڕاو بە هۆی گریانی زۆرەوە ⇆ یک چشم اشک و یک چشم خون

**چاوی تەماح:** *[کینایە]* چاوی تەماکاری ⇆ چشم طمع

**چاوی تەماکاری:** ☜ **چاوی تەماح**

**چاوی چەپراس:** ☜ **چاوی خێل**

**چاوی چەپوچێڵ:** ☜ **چاوی خێل**

**چاوی چەوێل:** ☜ **چاوی خێل**

**چاوی چێڵ:** ☜ **چاوی خێل**

**چاوی حیز:** *[مەجاز]* چاوی خاوەن وازی چاوچەڕێنی ⇆ چشم هیز

**چاوی خراپ:** *[مەجاز]* چاوی خراو/ پیس/ سۆتک؛ چاوێ کە برێ کەس وا دەزانن زیانی هەیە ⇆ چشم شور

**چاوی خراو:** ☜ **چاوی خراپ**

**چاوی خواروخێچ:** ☜ **چاوی خێل**

**چاوی خومان:** ☜ **چاوی مەست**

**چاوی خوێل:** ☜ **چاوی خێل**

**چاوی خێل:** چاوی خوێل/ چەپراس/ چەوێل/ چێڵ/ شاش/ چەپوچێڵ/ خواروخێچ/ دوو چاوی وا کە پێکەوە جووت نین ⇆ چشم تابتا

**چاوی دڵ:** *[مەجاز]* هێزی هەڵاوردن و ناسینی زەینی ⇆ چشم باطن

**چاوی دەرپەڕیو:** ☜ **چاوی بۆق**

**چاوی ڕەش:** چەوسی؛ چاوێ کە گلێنەی ڕەشە ⇆ چشم سیاه

**چاوی زاق:** ☜ **چاوی بۆق**

**چاوی سۆتک:** ☜ **چاوی خراپ**

**چاوی شاش:** ☜ **چاوی خێل**

**چاوی شین:** چاوی کەوو؛ چاوێ کە گلێنەی شینە ⇆ چشم زاغ

**چاوی کاڵ:** چاوی قاوەیی کاڵ یان ئاوی ⇆ چشم عسلی یا آبی

**چاوی کەژاڵ:** چاوی باز؛ چاوی گەورە و گەش ⇆ چشم شهلا

**چاوی کەوو:** ☜ **چاوی شین**

**چاوی گڵ:** چاوی نەخۆشی سوور هەڵگەڕاو ⇆ چشم دچار بیماری

**چاوی مەست:** چاوی خومار؛ چاوی نیوەخەوتوو ⇆ چشم خُمار

**لە چاو:** لە بەرانبەر ‹تا ڕۆژێک کوێخا، ڕوانییە دۆشاو/ لە چاو جارانا کەم هاتە بەر چاو! «گۆران»› ⇆ در مقایسه؛ در مقابل

⊡ **چاو بڕ کردن:** چاو هەتەر کردن؛ بە توانای دیتن بوون ‹بڕوانە ئێستەش بنچینەی ماوە/ تا چاو بڕ ئەکا لە هەر چوار لاوە «قانع»› ⇆ چشم کار کردن

**چاو بڕین:** ۱. زیدەگۆشت پێلوو بڕین ۲. *[مەجاز]* ڕوانین بە وردی ‹قورینگ چلەس زستان دەبڕن/ چاویان لە کوردستان دەبڕن «سوارە»› ۳. *[کینایە]*

لاسایی کردنەوە ≡ ١. برداشتن گوشت اضافی پلک با عمل جراحی ٢. چشم دوختن ٣. تقلید کردن

**چاو برینە ماڵی کەسێک:** *[کینایە]* بە تەمای داگیر کردنی ماڵی کەسێک بوون ≡ چشم بە مال کسی دوختن

**چاو بز کردنەوە:** بە زەقی ڕوانین بۆ ترساندن ≡ چشم‌غُره رفتن

**چاو بلین:** چاو وڵین ≡ چشم مالیدن

**چاو بەستن:** *[کینایە]* خاپاندن؛ فریو دان ≡ فریب دادن

**چاو بە مۆلەق ویستان:** چاو چوون؛ ڕەنگی مردوو لە ڕوو نیشتن ‹هەتا نەمردووم ماوم، وەرە هێزی هەناوم/ کەوتووم لە نەخۆشخان چاو بە مۆلەق ویستاوم «فولکلور»› ≡ بازماندن و سفید شدن چشم در حال احتضار

**چاو پرواندن:** ☜ **چاو گلۆفین**

**چاو پڕ بونەوە:** خیز و خۆڵ لە چاو کەوتن ≡ افتادن خاک و شن در چشم

**چاو پشکوتن:** چاو تروووکانن؛ دەس بە دیتن کردنی بەچکەی جانەوەر ≡ چشم گشودن حیوان نوزاد

**چاو پۆشان:** ☜ **چاو پۆشین**

**چاو پۆشین:** *[کینایە]* چاو پۆشان؛ لێ‌بووردن ‹بیست و حەوت ساڵە زووخاو ئەنۆشم/ لە زوڵم و جەورت هەر چاو ئەپۆشم «بێکەس»› ≡ چشم‌پوشی کردن

**چاو پەڕین:** چاو فڕین؛ چەم چەڤین؛ لەرزینی پەلکی چاو؛ پیلوو لەرزین ≡ چشم پریدن

**چاو پەڕینە تەوقی سەر:** *[مەجاز]* سەر سووڕ مان یان ترسانی زۆر ≡ چشم کسی چهار تا شدن

**چاو پیاخشاندن:** بە سەرچڵی تێ‌ڕوانین ≡ سرسری نگاه کردن

**چاو پێکەفتن:** ☜ **چاو پێ‌کەوتن**

**چاو پێکەوتن:** چاو پێ‌کەفتن؛ دیتن ≡ دیدن

**چاو پێهەڵنەهاتن:** *[کینایە]* ١. شەرم لێ‌کردن ٢. ڕک لێ‌بوونەوە ≡ ١. شرم داشتن ٢. بیزار بودن

**چاو پێ هەڵێنان:** *[کینایە]* ١. *[باوەڕی کۆن]* بە چاوەوە کردن؛ چاو لێدان ٢. ئیرەیی پێ بردن ≡ ١. چشم‌زخم زدن ٢. حسادت کردن

**چاو تاریک بوون:** *[کینایە]* ڕق هەستانی زۆر ≡ خشمگین شدن

**چاو ترسان:** *[مەجاز]* لە ڕواڵەتی کار/ شتێک تۆقان ‹دەس کار ئەکا و چاو ئەترسێ «مەسەل»› ≡ از ظاهر کاری ترسیدن

**چاو تروکان:** ☜ **چاو تروکاندن**

**چاو تروکاندن:** چاو تروووکان؛ چاو ترەکاندن؛ چاو ترەکانن؛ لێکدانی پیلوو؛ چاو لێک نان؛ چاو تروووکانن ≡ چشم بە هم زدن

**چاو تروکانن:** ☜ **چاو تروکاندن**

**چاو ترمکاندن:** ☜ **چاو تروکاندن**

**چاو ترمکانن:** ☜ **چاو تروکاندن**

**چاو تێبرین:** ١. *[کینایە]* تەماح تێ‌کردن ٢. لێ مۆڕ بوونەوە ≡ ١. چشم طمع دوختن ٢. چپ‌چپ نگاه کردن

**چاو چاو نەدیتن:** زۆر تاریک و لێڵ بوون ≡ چشم چشم را ندیدن

**چاو چوون:** ☜ **چاو بە مۆلەق ویستان**

**چاو چوونە خەو:** خەو لێ‌کەوتن ‹چاو چووە خەو، قنگ ئەبێتە برنەو! «مەسەل»› ≡ بە خواب رفتن

**چاو حیز کردن:** *[کینایە]* چاو داخستن؛ سەر داخستن؛ لە شەرمان چاو داخستن؛ سەر هەڵنەهێنان لە شەرمان ≡ سر بە زیر انداختن از شرمندگی

**چاو داخستن:** ١. ☜ **چاو حیز کردن** ٢. نەڕوانین بۆ نامەحرەم ≡ ١. ☜ **چاو حیز کردن**

٢. چشم را درویش کردن

**چاو داگرتن:** چاو قرتانن؛ سووچی چاو تررووکاندن بۆ تێگەیاندنی مەبەستێک ‹ناز دەکەن، چاو دادەگرن/ کوڕگەل دە بەریان دەمرن «هێمن»› 🇮🇷 چشمک زدن

**چاو داگرسان:** چاو داگرسیان؛ چاو داگیرسان؛ سوور هەڵگەڕان و ژان کردنی چاو 🇮🇷 چشم به درد آمدن

**چاو داگرسیان:** ☞ **چاو داگرسان**

**چاو داگیرسان:** ☞ **چاو داگرسان**

**چاو (لێ) دان:** *[باوەڕی کۆن]* کردنە چاوەوە 🇮🇷 چشم زدن

**چاو دانە سەن:** *[کینایە]* تەماح تێ کردن؛ بە تەمایەکەوە لێ ڕوانین 🇮🇷 چشم طمع دوختن به چیزی

**چاو داهاتن:** سوور بوون و ئێش کردنی چاو بە تیشکی خۆری هاوین 🇮🇷 درد گرفتن چشم از نور خورشید

**چاو دەرپەڕاندن:** زەق تواشا کردن بۆ ترساندن 🇮🇷 چشم‌غُره رفتن

**چاو دەرهێنان:** ١. کوێر کردن؛ دەرهێنانی گلێنەی چاو ٢. *[کینایە]* زۆر هار و هاج بوون؛ بە قسە و کردەوە خەڵک ئازار دان 🇮🇷 ١و٢. چشم درآوردن

**چاو ڕاخستن:** *[کینایە]* ڕوانین بە وردی؛ چاو گێڕان 🇮🇷 به دقت نگاه کردن

**چاو ڕشتن:** کل دە چاو کردن؛ سورمە دە چاو کێشان ‹چاو ڕشتنمان کالەوە بوو، شوو کردنمان بەتاڵەوە بوو «مەسەل»› 🇮🇷 سُرمه کشیدن

**چاو ڕەڵ کردن:** ورد نەدیتن بە هۆی ماندوویی، خەو یان گریانەوە 🇮🇷 چشم آلبالو گیلاس چیدن

**چاو ڕەش و کاڵ بوونەوە:** *[مەجاز]* خەجاڵەت بوون 🇮🇷 شرمنده شدن

**چاو زەق کردن:** بە تیر ڕوانین ‹بڕۆ! بگرە و شەق‌وپەق کە!/ لە دیلی گیراو چاو زەق کە! «گۆران»› 🇮🇷 خیره نگاه کردن

**چاو سپی بوون:** *[کینایە]* مردن 🇮🇷 مردن

**چاو سوور کردنەوە:** *[کینایە]* ترساندن؛ هەڕەشە کردن؛ هەڕ و گیف کردن 🇮🇷 تهدید کردن

**چاو شکان:** *[مەجاز]* ١. ترسان؛ نەترە چوون ‹قەت وا تێ‌نەگەن چاومان شکاوە/ کوشتن و بڕین دایم بۆ پیاوە «بێکەس»› ٢. پەند وەرگرتن و تەمێ بوون 🇮🇷 ١. ترسیدن ٢. تنبیه شدن

**چاو شکاندن:** ١. *[مەجاز]* ترساندن ٢. *[مەجاز]* سووک و چرووک کردن ٣. *[کینایە]* چاو داگرتن 🇮🇷 ١. ترساندن ٢. بی آبرو کردن ٣. چشمک زدن

**چاو شۆڕ کردنەوە:** *[مەجاز]* لە بەر پەشیمانی سەر داخستن 🇮🇷 سرِ ندامت به زیر انداختن

**چاو فڕین:** ☞ **چاو پەڕین**

**چاو قرتانن:** ☞ **چاو داگرتن**

**چاو قونجاندن:** ☞ **چاو قوچاندن**

**چاو قوچان/ قوچیان:** چاو نووقان؛ چاو نووسان؛ چاو چوونە سەر یەک 🇮🇷 چشم بسته شدن

**چاو قوچاندن/ قوچانن:** چاو قونجاندن؛ چاو مچاندن: ١. چاو لێکنان؛ چاو لە سەر یەک دانان؛ پەلک داخستن ٢. *[کینایە]* کەمتەرخەمی کردن ٣. *[کینایە]* خۆ دزینەوە لە کار 🇮🇷 ١. چشم بر هم نهادن ٢. اهمال کردن ٣. از زیر کار در رفتن

**چاو کردن:** *[کینایە]* وە بەر چاو هاتن؛ بە چاو دیتن 🇮🇷 به چشم دیدن

**چاو کردنەوە:** ١. چاو هەڵێنان ٢. *[کینایە]* ورد بوونەوە و سەرنج دان 🇮🇷 ١. چشم گشودن ٢. دقت کردن

**چاو کریانەوە:** ١. گەورە بوونی بێچووی پەلەوەران و گیانداران ٢. *[کینایە]* لە کار یان شوێنێک شارەزا بوون 🇮🇷 ١. چشم باز شدن ٢.

بصیرت یافتن

**چاو گرتن:** وه بەر دڵ کەوتن ‹تا دیم، چاوی گرتم› ☗ مورد پسند واقع شدن

**چاو گل بوون:** تووشی چاوئێشە هاتن ☗ مبتلا به چشم درد شدن

**چاو گلۆفین:** چاو پرواندن؛ گوشینی چاوان بە دەست ☗ چشم مالیدن

**چاو گەرم کردن:** *[مەجاز]* سووکە خەو کردن ☗ چُرت زدن

**چاو گەڕاندن:** چاو گەڕانن؛ چاو گێڕان؛ بەولاولادا ڕوانین ☗ به اطراف نظر کردن

**چاو گەڕانن:** ☜ چاو گەڕاندن

**چاو گێڕان:** ☜ چاو گەڕاندن

**چاو لە بەر کەسێک/ شتێک هەڵنەهاتن:** *[کینایە]* بێ‌ئەندازە جوان بوون ‹هێندە جوان و لەبراه چاوی لە بەر هەڵنایە› ☗ بسیار زیبا بودن

**چاو لە چاو هاتن:** *[مەجاز]* نەدیتنەوە ‹دە بڕۆ با چاوم لە چاوت بێ!› ☗ دیدار به قیامت شدن

**چاو لە دوای کەسێک/ شتێک بوون:** چاوەڕوان بوون؛ هومێد نەبڕان لە کەسێک/ شتێک ☗ چشم به دنبال کسی/ چیزی بودن

**چاو لە دەستی کەسێک بوون:** *[کینایە]* بە هیوای یارمەتی کەسێک بوون ☗ چشم یاری از کسی داشتن

**چاو لە دەمی کەسێک بوون:** *[کینایە]* گوێڕایەڵی کەسێک بوون ‹ئێستە بۆ وا ڕەبەن و داماوم/ من هەڵۆ چاو لە دەمی قالاوم «سوارە»› ☗ چشم به دهان کسی داشتن

**چاو لە سەر هەڵنەگرتن:** چاودێری کردن ☗ چهارچشمی مواظب بودن

**چاو لە شتێک ڕوانین:** *[کینایە]* لەگەڵ شتێک هەڵسەنگاندن؛ لە بەرامبەر دانان ☗ مقایسه کردن

**چاو لە شتێک قووچاندن:** *[کینایە]* ۱. چێتر چاوەڕوانی خێروبێری شتێک نەبوون ۲. خۆ لە نەدیتن دان؛ وە سەر خۆ نەهێنان ☗ ۱. از خیر چیزی گذشتن ۲. به روی خود نیاوردن

**چاو لە کەس/ شتێک هەڵنەهاتن:** *[مەجاز]* زۆر لێی بێزار بوون ☗ چشم دیدن کسی/ چیزی را نداشتن

**چاو لێبڕین:** ۱. بە تەما بوون ۲. لاسا کردنەوە؛ دەمەلاسکە کردنەوە ☗ ۱. امیدوار بودن ۲. تقلید کردن

**چاو لێبوون:** ۱. چاو پێوە بوون؛ لە بەر چاوەوە بوون ۲. *[مەجاز]* چاوەڕوان بوون ‹ئەمە کردەوەی لاوەکانمانە/ کە وا کوردستان چاوی لەوانە «بێکەس»› ☗ ۱. در معرض دید بودن ۲. چشم داشتن

**چاو لێدان:** *[کینایە]* بە چاوەوە کردن؛ کردنە چاوەوە؛ چاوی پیس لێدان ☗ چشم زدن

**چاو لێقووچاندن:** چاو لێنووقان؛ چاو لێنووقاندن؛ چاوپۆشی کردن؛ بن لیچدان؛ خۆ لێدزینەوە ☗ چشم پوشیدن

**چاو لێکردن:** ۱. تواشا کردن؛ لێنواڕین ۲. لاسایی کردنەوە ‹نامەوێ کورم چاو بکا لە کەس/ خەڵقم بۆ بگرێ و بیکا بە ژێردەس «قانع»› ☗ ۱. نگریستن ۲. تقلید کردن

**چاو لێک نان:** ۱. چاو قونجاندن؛ پیلووی چاو بە سەر یەکا هێنان ۲. *[کینایە]* مردن ☗ ۱. چشم بر هم گذاشتن ۲. مردن

**چاو لێنوقان:** ☜ چاو لێقووچاندن

**چاو لێنوقاندن:** ☜ چاو لێقووچاندن

**چاو لێهاتن:** *[کینایە]* بەغیلی پێ بردن ‹چاوت لێدێ ئەو کارە من کردم› ☗ حسادت کردن

**چاو مچاندن:** ☜ چاو قووچاندن

**چاو نوقان:** ☜ چاو قووچان

**چاو نوسان:** ☜ چاو قووچان

**چاو نوساندن:** /کینایە/ کار بە دەغەڵبازی و ناتەواوی جێ هێشتن ‹هەروا چاوی نووساند و دایە دەستی› 🇮🇷 کار را نیمەکارە رها کردن

**چاو و دڵی کەسێ ڕۆشن/ ڕون بونەوە:** شاد و بەختەوەر بوون ‹چاو و دڵتان ڕوون کوڕەکەتان هاتەوە!› 🇮🇷 چشم و دل کسی روشن شدن

**چاو هەتەر نەکردن:** /کینایە/ لە مەودای حوکمی چاودا نەبوون 🇮🇷 خارج از قدرت دید بودن

**چاو هەڵاتن:** /مەجاز/ ١. وریا بوون لە کار و بار؛ فێر بوونی ئەرکی سەر شان ٢. ڕجوا دیتن ‹چاوم هەڵنایە لە کاری وا ناهەق› 🇮🇷 ١. آشنا شدن؛ راه افتادن ٢. روا دیدن

**چاو هەڵتەکاندن:** چاو هەڵتەکانن؛ بە چاو هێما کردن؛ بە بزاوتنی چاو تێگەیاندن ‹چاوێکی لێهەڵتەکاند و پەشیمانی کردەوە› 🇮🇷 اشارە کردن

**چاو هەڵتەکانن:** ☜ چاو هەڵتەکاندن

**چاو هەڵگلۆفین:** بە دەست چاو مشتوماڵ دان و سڕینەوە 🇮🇷 چشم را مالیدن

**چاوی کەسێ ڕۆشن/ ڕون بون:** ١. /مەجاز/ شاد بوون ٢. /پلار/ ناڕاستیی شتێ دەرکەوتن ‹چاومان ڕۆشن، ئێرەش هەر ئەو بەزمەیە!› 🇮🇷 ١. شاد شدن ٢. قُبح چیزی آشکار شُدن

**بە چاوەوە بون:** بوونە چاوەوە؛ کەفتنە بەر چاوچلە؛ لە ئێرەیی چاوپیسان تووشی بەڵا هاتن 🇮🇷 چشم خوردن

**تا چاو کار کردن:** /کینایە/ تا شوێنێ کە چاو هەتەر بکا 🇮🇷 تا چشم کار کردن

**کردنە چاو:** وە بەر چاو گرتن؛ دیتن و چاو لێهەڵنەگرتن 🇮🇷 زیر نظر گرفتن

**کردنە چاوەوە:** ☜ چاو لێدان

**کەوتنە بەر چاو:** ١. بە هەڵکەوت دیتن ٢. بە چاوەوە بوون ٣. دیتران 🇮🇷 ١. اتفاقی دیدن ٢. چشم خوردن ٣. بە چشم خوردن

**لە بەر چاو بون:** /کینایە/ لە بیر بوون؛ فەرامۆش نەکردن ‹چاکە وا لە بەر چاوم/ هەتا لە دنیا ماوم «بێکەس»› 🇮🇷 پیش چشم داشتن

**لە بەر چاو کەوتن:** بێزران ‹ئیدی لە بەر چاوم کەوت› 🇮🇷 از چشم افتادن

**لە چاو کەسێکەوە دیتن:** لە کەسێکەوە زانین ‹هەموو ئەم کارە خراپانە لە چاو تۆوە ئەبینم› 🇮🇷 از چشم کسی دیدن

**چاوئێشە** / çaw'êşe/: ناو. چاوێشە؛ ژانی چاو؛ نەخۆشی چاو؛ چاڤ‌کولی 🇮🇷 چشم‌درد

**چاوا** / çawa/: ئاوەڵکار. چلۆن؛ چۆن؛ کوو 🇮🇷 چطور

**چاوان**[1] / çawan/: ئاوەڵناو. چلۆن؛ کوو 🇮🇷 چگونە

**چاوان**[2]: ئاوەڵکار. چلۆن؛ چۆن 🇮🇷 چگونە

**چاوانە** / çawane/: ناو. ١. چالاو؛ بیر ‹چاوانە هیچی پێ نایێ، قنگ دۆلچە کونا ئەوێ «مەسەل»› ٢. دەمی زام 🇮🇷 ١. چاه آب ٢. سرِ زخم

⊡ **چاوانە کردنەوە:** ☜ چاوگە داکەوتن

**چاوباز** / çawbaz/: ئاوەڵناو. ١. /مەجاز/ چاوجوان ‹لە بەر نازی چاوبازان خورد و خەوم خویناوە/ بە تیری تیرەندازان چ بکەم جەرگم براوە «وەفایی»› ٢. چاوچلێس؛ چاوچڕێن؛ چاوچەڕێن؛ چاوباشقاڵ؛ تۆلاز؛ نەزەرباز ‹چونکە لاوێکم، ڕاستم، فێڵباز نیم/ چونکە چاوباز نیم، بە فیز و ناز نیم «پەشێو»› 🇮🇷 ١. زیباچشم ٢. چشم‌چران

**چاوبازە** / çawbaze/: ☜ چاوپانکە

**چاوبازی** / çawbazî/: ناو. چاوچلێسی؛ تۆلازی 🇮🇷 چشم‌چرانی

**چاوباشقال** / çawbaşqal/: ☜ چاوچەڕێن

**چاوباشقاڵ** / çawbaşqał/: ئاوەڵناو. چاوچلێس؛ تۆلاز 🇮🇷 چشم‌چران

**چاوبرسی** / çawbirsî/: ئاوەڵناو. /مەجاز/ چنۆک؛ چاڤ‌برچی؛ چاڤ‌برسی؛ چاونەزێر؛ چەنچووز؛ پڕکێش؛ تێرنەخۆر؛ چکووس؛ تەماکار؛ لێشتۆک؛

هەفهەفی؛ دەڤبەش؛ چلماس؛ چاوچنۆک ☲ حریص

**چاوبریقە** / çawb(i)rîqe/: ناو. شەووریشە؛ گوڵئەستێرە ☲ کرم شبتاب

**چاوبڕ** / çawbiř/: ناو. برینگەری چاوان؛ ئەو کەسەی پیلوو دەبڕێ ☲ جرّاح چشم

**چاوبڕکە** / çawbiřke/: ناو. چاوبڕکێ؛ چاوەبڕکە: ١. چاوقرتکێ؛ کاری بە چاو یەکتر حاڵی کردن؛ تێ گەیاندن بە چاو ٢. کێبەرکێی نەقوونجاندنی چاو ☲ ١. به اشاره گفتن ٢. مسابقەی چشم باز

**چاوبڕکێ** / çawbiřkê/: ☜ چاوبڕکە

**چاوبڕکێن** / çawbiřkên/: ☜ چاوەبڕکێن

**چاوبز**[1] / çawbiz/: ناو. گزوفت ☲ خیت

**چاوبز**[2]: ☜ چاوزەق

**چاوبژیشک** / çawb(i)jîşk/: ☜ چاوپزیشك

**چاوبژیشکی** / çawb(i)jîşkî/: ☜ چاوپزیشکی

**چاوبلۆق** / çawb(i)loq/: ☜ چاوزەق

**چاوبۆرە** / çawbore/: ناو. گیایەکی دڕکاوییە ☲ گیاهی است

**چاوبۆق** / çawboq/: ☜ چاوزەق

**چاوبەپۆرگ** / çawbepořig/: ☜ چاوزەق

**چاوبەرەژێر** / çawberejêr/: ئاوەڵناو. [مەجاز] ١. بەرباری منەت ٢. تەریقەوەبوو؛ فهێدکار ☲ ١. زیر بار مِنّت ٢. شرمنده

**چاوبەس** / çawbes/: ☜ چاوبەست

**چاوبەست**[1] / çawbest/: ناو. چاوبەس؛ چاوبەن؛ چاوبەند؛ دەسرەیەک کە لە گەمەدا چاوی پێ دەبەستن ☲ پارچەی چشمبند

⊡ **چاوبەست کردن:** [کینایە] خەڵەتاندن و فریو دان ☲ فریب دادن

**چاوبەست**[2]: ئاوەڵناو. [کینایە] چاوبەس؛ چاوبەن؛ چاوبەند؛ دەسبڕ؛ فێڵباز؛ خاپینۆک ‹چاوبەستی فەلەک دەستی بڕیم کوێرانە/ خستمیە جەهەندەمێک و ناوی ژیانە «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ☲ حیلەگر

**چاوبەستراو** / çawbest(i)raw/: ئاوەڵناو. چاوبەستە؛ چاوبەسراو؛ چاوگرێدای ☲ چشمبسته

**چاوبەستە** / çawbeste/: ☜ چاوبەستراو

**چاوبەستی** / çawbestî/: ناو. [کینایە] هەر یەکە لەو کارە سەیر و سەمەرانە کە بە تەڕدەستی و کەڵک وەرگرتن لە هەڵەی چاو و خڵەتاندنی هەستی بینەر دەکرێن ☲ چشمبندی

**چاوبەسراو** / çawbesraw/: ☜ چاوبەستراو

**چاوبەسێن،چاوبەسیان** / çawbesên çawbesyan/: ☜ چاوشارەکێ

**چاوبەکل** / çawbekil/: ئاوەڵناو. خاوەن چاوی بە کل ڕێژراو ☲ با چشمانی سرمه کشیده

**چاوبەڵ** / çawbel/: ئاوەڵناو. [مەجاز] چاوچلێس؛ چاوحیز، بەتایبەت سەبارەت بە ژنێ کە زۆر لە پیاوان دەڕوانێ ☲ نظرباز

**چاوبەڵەک** / çawbełek/: ئاوەڵناو. چاوڕەشی سپی پێست ☲ چشمسیاه پوستسفید

**چاوبەمۆڵەق** / çawbemołeq/: ☜ چاوزەق

**چاوبەن** / çawben/: ☜ چاوبەست

**چاوبەند** / çawbend/: ☜ چاوبەست

**چاوپانکە** / çawpanke/: ناو. چاوبازە؛ چاوزەقە؛ چەوبازە؛ گیایەکی گەڵاخڕی گوڵ زەردە، سووری دەکەنەوە و دەیخۆن ☲ گیاهی خوراکی

**چاوپرووش** / çawp(i)rûş/: ئاوەڵناو. چاڤکز؛ میتۆ؛ کوێرەمووشە ☲ دارای چشمانی کمسو

**چاوپرووشە** / çawp(i)rûşe/: ناو. کوس‌کوسک؛ مژومۆڕی هاوڕێ لەگەڵ تروووکاندنی لە سەر یەکی چاودا ☲ کمسویی با پلک زدن پیاپی

**چاوپزیشک** / çawp(i)zîşk/: ناو. چاوبژیشک؛ پزیشکی تایبەتی چاو ☲ چشمپزشک

**چاوپزیشکی** / çawp(i)zîşkî/: ناو. چاوبژیشکی؛

لقێ لە زانستی پزیشکی کە دەپەرژێتە سەر لێکۆڵینەوەی پێکهاتە، کار، نەخۆشی و دەرمانی چاو ≣ چشم‌پزشکی

**چاوپشیله** / çawp(i)şîle/: ناو. چاوەپشیله؛ گیایەکە لە چاوی پشیلە دەکا ≣ گیاهی است شبیه چشم گربه

**چاوپۆشی** / çawpoşî/: ناو. [کینایە] چاڤ‌گری؛ کار و ڕەوتی لێبووردن و تۆڵە نەکردنەوە ≣ چشم‌پوشی

**چاوپیس** / çawpîs/: ناوەڵناو. [مەجاز] چاڤینۆک؛ چاوچەپەڵ؛ چاوچلکن؛ چاوخراپ؛ چاوسۆتک؛ بە تایبەتمەندی زیان گەیاندن ‹بەژنەکەت لە چاوپیسان بە دوور بێت/ هەرچی لە بەر کەی بە ڕاستی لێت دێت «فولکلۆر»› ≣ چشم‌شور

**چاوتاریک** / çawtarîk/: ناوەڵناو. [مەجاز] ڕەش‌بین؛ بەدبین؛ خاوەن لێکدانەوە و هەڵسەنگاندنی خراپ و داوەری چەوت بەرانبەر بە دیاردە و ڕووداوان ≣ بدبین

**چاوترسێن** / çawtirsên/: ناوەڵناو. [کینایە] تەمێ ≣ متنبه

⊡ **چاوترسێن بوون**: [کینایە] تەمێ بوون؛ ژێر بوون ≣ ادب شدن

**چاوترسێن کردن**: [کینایە] تەمێ کردن؛ ژێر کردن ≣ ادب کردن

**چاوترووکانێک** / çawt(i)rûkanêk/: ناوەڵکار. ماوەیەکی یەکجار کەم ‹(بە) چاوترووکانێک دەتگەمێ› ≣ یک چشم به هم زدن

**چاوتوند** / çawtund/: ☜ **چاوقایم**

**چاوتەنگ** / çawteng/: ناوەڵناو. [مەجاز] ڕژد؛ چکووس؛ دەس‌قووچاو؛ چاونەزێر ≣ تنگ‌چشم

**چاوتیژ** / çawtîj/: ناوەڵناو. [مەجاز] چاوڕوون ≣ تیزبین

**چاوتێر** / çawtêr/: ناوەڵناو. [مەجاز] بەرچاوتێر؛ بێ‌نیاز؛ دوور لە چاوچنۆکی ≣ بی‌نیاز؛ چشم و دل سیر

**چاوجوان** / çawc(i)wan/: ناوەڵناو. چاوباز ≣ زیباچشم

**چاوچاڵ** / çawçał/: ☜ **چاوقووڵ**

**چاوچڕێن** / çawç(i)řên/: ☜ **چاوچەڕێن**

**چاوچڕێنی** / çawç(i)řênî/: ☜ **چاوچەڕێنی**

**چاوچلکن** / çawçiłkin/: ☜ **چاوپیس**

**چاوچڵە**[1] / çawç(i)łe/: ناو. چاووچڵە؛ چاوەزار؛ نووشتەی چاوزار ≣ چشمارو

⊡ **کەوتنە بەر چاوچڵە**: بوونە چاوەوە ≣ چشم خوردن

**چاوچڵە**[2]: ناوەڵناو. [مەجاز] چاووچڵە؛ چاوپیس ≣ چشم‌شور

**چاوچڵێس** / çawç(i)łês/: ناوەڵناو. [مەجاز] چاوحیز؛ چاوباز؛ چاوچڕێن؛ چاوباشقاڵ؛ چاڤلەدەر؛ تۆلاز؛ قۆق؛ حەزۆک و خووگرتوو بە تەماشای ناڕەوا بە هەویای جینسییەوە ≣ چشم‌چران

**چاوچڵێسی** / çawç(i)łêsî/: ☜ **چاوچەڕێنی**

**چاوچنۆک** / çawç(i)nok/: ناوەڵناو. [مەجاز] چاڤ‌چنۆک: ١. بەتەماح ‹نۆکەر و سەرمایەداری چاوچنۆک/ شاربەدەر کەن، دەربەدەر کەن بێ‌وچان «قانع»› ٢. چاونەزێر؛ بەئێرەیی. هەروەها: **چاوچنۆکی** ≣ ١. آزمند ٢. حسود

**چاوچۆڕیاگ** / çawçořyag/: ناوەڵناو. چاوداقلیشاو؛ پیلوو هەڵگەڕاوە ≣ پلک‌برگشته

**چاوچوو** / çawçû/: ناوەڵناو. [مەجاز] چاوبرسی؛ بەخیل ≣ حریص

**چاوچەپوچێڕ** / çawçep û çêř/: ناوەڵناو. چاوگێڕ؛ چاولار ≣ لوچ

**چاوچەپوچێڵ** / çaw çep û çêł/: ☜ **چاوچێڵ**

**چاوچەپوڕاس** / çaw çep û řas/: ☜ **چاوچێڵ**

**چاوچەپەڵ** / çawçepeł/: ☜ **چاوپیس**

**چاوچەڕێن** / çawçerên/: ناوەڵناو. چاوباز؛

چاوچرێن؛ چاوچڵێس؛ چاوباشقاڵ؛ چەوباز؛ تـۆلاز ▬ چشم‌چران

**چاوچەرێنی / çawçerênî/**: ناو. تـۆلازی؛ تـۆلازی؛ چاوچرێنی؛ چاوچڵێسی؛ چـاوحیزی؛ چـەوبازی؛ چەوپیسی؛ چاولەوەرێنی ▬ چشم‌چرانی

**چاوچێڵ / çawçêł/**: ناوەڵناو. چاوچـەپوچـێل؛ چاوچەپوڕاس؛ خێل؛ خوێل ▬ لوچ

**چاوحەواوی / çawĥewawî/**: ☜ **چاوحەوایی**

**چاوحـەوایی / çawĥewayî/**: نـاو. چاوحـەواوی؛ حەوایی ▬ کلاپیسە

**چـاوحیز / çawĥîz/**: ناوەڵـناو. *[مـەجاز]* چاوغـاین؛ چاوچڵێس ▬ چشم‌چران

**چاوحیزی / çawĥîzî/**: ☜ **چاوچەرێتی**

**چاوخراپ / çawx(i)rap/**: ☜ **چاوپیس**

**چاوخوار / çawx(i)war/**: ناوەڵناو. خێل؛ هەڵـجەر؛ خوێل ▬ لوچ

**چاوخومار / çawxumar/**: ناوەڵناو. چاومەس «ئـەی نیگاری چاوخوماری بێ‌وەفا/ بەسـیەتی بـێ‌مـەیلی و جەور و جەفا «هێمن»» ▬ دیده‌خمار

**چاوخێل / çawxêl/**: ناوەڵناو. دووبین؛ کـاژ؛ خوێـل ▬ دوبین؛ لوچ

**چاودار / çawdar/**: ناو. ١. چاویار؛ چۆدان؛ چەودار؛ چەودەر؛ چەوان؛ چەودەن؛ چەودان؛ چێودان؛ جۆ فەرەنگی؛ گیایەک لە ڕەگەزی گەنم کـە گـەڵای پـانی هەیـە و سـەلکەکەی بـەلادا دەکـەوێ و دانەکانیشی دەخورێ ٢. دەنکە؛ چـۆدان؛ دانـەی ئـەو گیایـە کـە خـۆراکی ئاژەڵـە ٣. *[مـەجاز]* چاوەنێری؛ ئاگاداری بە چاو ▬ ١. چاودار ٢. دانەی چاودار ٣. مُراقبت

**چاوداقڵیشـــــــــاو / çawdaq(i)łîşaw/**: ☜ **چاوچۆڕیاگ**

**چاوداگیرسـێن / çawdagîrsên/**: نـاو. *[مـەجاز]* دەستەچیلەی ئاگر ▬ افروزە

**چـاودێر / çawdêr/**: ناو. *[مەجاز]* چـاوەدێر؛ چاویـار؛ چاڤدێر؛ چاڤێر؛ چاوێر؛ کەتوان؛ کەسێ کە دەبـێ ئاگاداری دروست بەڕێوە چوونی کارێک بێت، بێ ئەوەی خۆی کار بکا ▬ ناظر

**چـاودێری / çawdêrî/**: نـاو. *[مـەجاز]* چـاوەدێری؛ چاویاری؛ چاڤـدێری؛ چاڤـێری؛ چـاوێری؛ کـار و ڕەوتی پایین؛ بەردایین؛ پێ ڕاگەیشتن، پرسـینەوە و چاو لێ‌کردن بۆ دڵنیایی لە باش بەڕێوە چوونی کارێک «دایکیشـت لـە مـن بـووە بـە دایکـی هـاڵ/ چاودێریـم ئەکا ئەو لـە ژێـر هـەرزاڵ «فولکلـۆر»» ▬ نظارت

**چاوڕۆگە / çawroge/**: ناو. زمانەگا ▬ گیاه گاوزبان

**چـاوری / çawrî/**: ناو. ١. چارەوێ؛ چاروا ٢. شەرم؛ چاوڕوو ▬ ١. چهارپا ٢. آزرم

**چـاوڕاو / çawřaw/**: نـاو. *[مـەجاز]* چـاووڕاو: ١. بـافیش؛ کـاری خـۆ هەڵکێشـان ٢. چـاوەڕاو؛ شات‌وشووت؛ درۆ و هەڵبەستە «لە شێخ و سۆفی مەرحەبا مەکە!/ بە درۆ و چـاوڕاو، نـان پەیـدا مەکـە! «قانع»» ▬ ١. خودستایی ٢. لاف‌وگزاف

**چاوڕوان / çawř(i)wan/**: ☜ **چاوەڕوان**

**چاوڕۆشـنکەرە[١] / çawřoşinkere/**: نـاو. *[مـەجاز]* دەستەچیلەی ئاگر ▬ افروزە

**چاوڕۆشنکەرە[٢]**: ناوەڵـناو. *[کینایـە]* دڵخۆشـکەر ▬ خوشحال‌کننده

**چاوڕۆشنی / çawřoş(i)nî/**: ناو. *[کینایە]* ١. مـژدەی خۆش ٢. دیارێ کە دۆستان یـان نزیکـان، بـە نیشـانەی شـادی دەربـڕین لـە ڕووداوێـک بـۆ کەسێکی دێنن ▬ ١. مُژده ٢. چشم‌روشنی

**چاوڕوو / çawřû/**: ناو. *[کینایە]* شەرم؛ حەیا؛ فهێت؛ فەدی ▬ شرم

**چاوڕوون / çawřûn/**: ☜ **چاوتیژ**

**چاوڕوونی / çawřûnî/**: ناو. *[کینایە]* ١. پیرۆزبایی ٢. مـژدەی خـۆش ٣. دیـتنی خۆشەویسـت ▬ ١.

تبریک ۲. مُژده ۳. دیدار عزیزان

**چاوڕەش** / çawřeş/: ئاوەڵناو. خاوەن چاوی ڕەش ☰ سیاه‌چشم

**چاوڕەشۆک** / çawřeşok/: ناو. خلۆلک؛ گوڵێکە ☰ گُلی است

**چاوزار** / çawzar/: ☜ **چاوەزار**

**چاوزاق** / çawzaq/: ☜ **چاوزەق**

**چاوزاقلە** / çawzaqle/: ناو. پاوزاخە؛ چاوزەقە؛ گیایەکی دڕکاوی تیژە لە نێو مەزرادا دەڕوێ ☰ گیاهی خاردار

**چاوزل** / çawzil/: ☜ **چاوگا**

**چاوزەق** / çawzeq/: ئاوەڵناو. چاوبز؛ چاوبلۆق؛ چاوبۆق؛ چاوزاق؛ چاڤزەق؛ چاڤلدەر؛ چەمزاق؛ چاوبەمۆڵەق؛ چاوبەپۆڕگ؛ چاودەرپەڕیو ☰ چشم‌برآمده

**چاوزەقە** / çawzeqe/: ناو. ۱. ☜ **چاوپانکە** ۲. یارییەکی لاوانە، هەر دوو سەری پشتێنی پێکەوە گرێ دەدەن دوو کەس ڕووبەڕووی یەکتر دادەنیشن و پشتێنەکە لە ملیان دەکەن و بەر پێیان بە یەکەوە دەنێن، هەر کەس بەهێز بێ ئەویتر هەڵدەستێنێ و دەیکێشێ بۆ لای خۆی ☰ ۱. ☜ **چاوپانکە** ۲. از بازی‌ها

**چاوزەقی** / çawzeqî/: ناو. گز؛ بزی ☰ چشم برجستگی

**چاوساخ** / çawsax/: ☜ **چاوساغ**

**چاوساخی** / çawsaxî/: ناو. وێنایی؛ وینایی؛ سۆمایی ☰ بینایی

**چاوساغ** / çawsağ/: ناو. چاوساخ؛ کەسێ کە دەستی کوێرێک دەگرێ و لە ڕێ ڕۆیشتندا یارمەتی دەدا «شەوی وا بوو دە و دوازدە حافزم لە خۆم کۆ دەکردەوە. خوشکم دەیگوت: لەوەتا سازی، بوویەتە چاوساغی حافزان! «هەژار، چێشتی مجێور»» ☰ عصاکش

**چاوسپیلکە** / çaws(i)pîlke/: ناو. گیایەکی دڕکاوییە گوڵی زەرد دەکا ☰ گیاهی خاردار

**چاوسۆتک** / çawsotik/: ئاوەڵناو. [مەجاز] چاوپیس؛ چاڤینۆک ☰ چشم‌شور

**چاوسور** / çawsûr/: ئاوەڵناو. [کینایە] چاڤسۆر؛ پارێزەر؛ خەمخۆر ☰ دلسوز

**چاوسوری** / çawsûrî/: ناو. [مەجاز] ئازایەتی؛ نەترسی ☰ شُجاعت

**چاوشارکێ** / çawşarkê/: ☜ **چاوشارەکێ**

**چاوشارەکی** / çawşarekî/: ☜ **چاوشارەکێ**

**چاوشارەکێ** / çawşarekê/: ناو. چاوشارکێ؛ چاوشاریکێ؛ چاوشارەکی؛ چاوشلکانێ؛ چاوشێرکانێ؛ بەشارکانێ؛ خۆشارکێ؛ خۆشارۆکی؛ خۆرماشارەکی؛ قۆمەشارەکی؛ شارشارێن؛ شارشارکێن؛ قەرا_قەرا؛ قەرە_قەرە؛ قەرە_قەرێ؛ قەلە_قەلە؛ قەرێ_قەرێ؛ قاو_ قاو؛ ڤەشارتوک؛ ڤەشارکۆ؛ حەمەگورگێ؛ هشار؛ هشار_ هشار؛ هەشار_ هەشار؛ هشارهشارەکی؛ زۆپ_زۆپ؛ وژاشارکێ؛ چاڤشەیتانۆک؛ ملاسەکوتێ؛ تەی؛ قولوولوو؛ تەی ـ تەی؛ چاوبەسێن ـ چاوبەسێن؛ کاکلەشێران؛ چاوبەسێن_ چاوبەسیان؛ گەمەیەکی زارۆکانە بەم شێوە یەکیان بەر چاوی خۆی دەگرێ و باقی خۆ دەشارنەوە، ئەم جار ئەوەی چاوی بەستووە دەبێ پێش ئەوەی باقی بگەنەوە شوێنی چاوبەستنەکە پەیدایان بکا و قاویان بدا ☰ قایم‌باشک

**چاوشاریکێ** / çawşarîkê/: ☜ **چاوشارەکێ**

**چاوشاش** / çawşaş/: ئاوەڵناو. خێل؛ خوێل ☰ لوچ

**چاوشلکانێ** / çawşilkanê/: ☜ **چاوشارەکێ**

**چاوشۆر** / çawşor/: ناو. شووشەی تایبەتی چاوی ئێشاو شوتن ☰ چشم‌شوی

**چاوشۆڕ** / çawşoř/: ئاوەڵناو. [مەجاز] تەریقەوەبوو؛ تەریقەوەبوو؛ فەدیکار. هەروەها: **چاوشۆڕی** ☰

شرمنده

**چاوشـەیتانـە** / çawşeytane/: نـاو. شـەیتانۆکە؛ هێلکەشەیتان ☰ حلزون

**چاوشین** / çawşîn/: ناوەڵناو. چاوکەوە ☰ زاغچشم

**چاوشێرکانێ** / çawşêrkanê/: ☜ **چاوشارەکێ**

**چاوغاین** / çawğayin/: ☜ **چاوحیز**

**چاوقـایم** / çawqayim/: ناوەڵناو. *[مەجاز]* چاوتونـد: ١. بێشەرم؛ بەڕوو؛ ڕووقایم ٢. نەترس؛ بەغیرەت ☰ ١. چشم دریده ٢. نترس؛ دلیر

**چاوقرتکێ** / çawqirtkê/: ☜ **چاوبڕکە ـ١**

**چاوقووچاو** / çawqûçaw/: ناوەڵناو. ١. چاو لێکناو ٢. *[کینایە]* ها لە هیچ نە ‹کۆنەپەرستی چاوقووچاو!/ لـە جـەژنی گـەل بـۆ ئەترسـی؟ «گـۆران»› ☰ ١. چشم‌بسته ٢. چشم و گوش بسته

**چاوقـوڵ** / çawqûł/: ناوەڵـناو. چاوچـاڵ؛ چـاو تەپیاگ؛ دۆخـی پێچەوانـەی چـاوزەق ☰ چشـم فرورفته

**چاوقوڵکـە** / çawqûłke/: نـاو. چاوقوولـی؛ چاوەقوولـی؛ چاوەقوولـە؛ چەمەقوولـە؛ وەبـا؛ یەختەسار؛ کول؛ کولـک؛ درووشـە؛ ئـاهۆ؛ فـەتا؛ درمـی ڕشـانەوە؛ پەتایـەکی تووشـی ناوچـەی گەرمێنە مرۆ تووشی زگەشـۆرە، ڕشـانەوە، سـارد بوونەوە، کەم بوونەوەی ئاوی لەش و لـە ئاکامـدا خەسـت بوونـەوەی خـوێن و شـین و ڕەش هەڵگەڕانی پێست دەکا، دەرمان نەکرێ دەکوژێ ☰ وبا

▣ **چاوقوڵکەی گـا**: لاڕەشـە؛ قـۆڕە؛ گاقـڕان ☰ طاعون گاوی

**چاوقوڵکەی مامر**: ئازاری مریشک؛ پۆپەڕەشە ☰ طاعون پرنده

**چاوقوڵی** / çawqûłî/: ☜ **چاوقوڵکە**

**چـاوک** / çawik/: نـاو. کانیـاو؛ کـانی؛ چەشـمـە ☰ چشمه

**چاوکـاڵ** / çawkał/: ناوەڵـناو. چاوکـەژاڵ ☰ چشـم عسلی

**چـاوکراوە** / çawk(i)rawe/: ناوەڵـناو. *[مـەجاز]* تێگەیشتوو؛ لە دنیازان ‹من تەشـیڕێسـێکی وەک شـیرنی «وەفـایی»م بـۆ چییـە؟! کیـژی وریـای چاوکراوەی فێرەزانینم دەوێ «هێمن»› ☰ آگاه

**چـاوکز** / çawkiz/: ناوەڵناو. پـرووش؛ کـەمبـین ☰ دارای چشم کم‌سو

**چـاوکزی** / çawk(i)zî/: ناو. چاڤتاری ☰ کم‌سویی چشم

**چاوکسکە** / çawkiske/: ناو. جۆرە ترێیەکی سپییە لە بۆڵ مازوو دەکا ☰ نوعی انگور

**چاوکوتکە** / çawkutke/: ☜ **چاوپانکە**

**چاوکولی** / çawkulî/: ناو. چاوئێشە ☰ چشم‌درد

**چاوکونەسـوژن** / çawkunesûjin/: ناوەڵـناو. *[کینایـە]* چاوچکۆلە ☰ چشم‌کوچک

**چاوکونەمەتـە** / çawkunemete/: ناوەڵـناو. *[کینایـە]* چاوچکۆلە ☰ چشم‌کوچک

**چاوکە** / çawke/: ناو. ١. کانی؛ سەرچاوەی ئـاوی سروشتی لە سەر زەوین کە بە هۆی هاتنە دەری ئـاوی ژێـر زەوینـەوە بـەدی دێـت ٢. چاوگـە؛ سەرچاوە؛ شوێنێ کە چۆمێکی لێوە بـەدی دێ و مەرخی لـەوێوە دەسـتپێدەکا ٣. دەسـتەچیلەی چاوەی ئاگر ☰ ١. چشمه ٢. سرچشمه ٣. افروزه

▣ **چاوکە داکەفتن**: ☜ **چاوگە داکەوتن**

**چاوکەرەشێرە** / çawkereşêre/: ☜ **چاوکەڵەشێرە**

**چاوکـەژاڵ** / çawkejał/: ناوەڵـناو. چـاوجوان؛ ئاسکچاو ‹لە کونجێ بێوەژن دەگری و دەناڵێ/ لـە کۆشکێ بادەگێڕە چاوکەژاڵێ «هێمن»› ☰ آهوچشم

**چاوکەسک** / çawkesk/: نـاو. گیایـەکی گەڵاپانـە وەک سێوەڕە، بنجی بە زەویدا پان دەبێتـەوە ☰ گیاهی است

**چاوکەڵەشێرە** / çawkełeşêre/: ناو. چاوکەرەشـێرە؛

گیایەکە تۆمێکی سوور دەکات ≡ گیاه چشم خروس

**چاوکەوە / çawkewe/**: ئاوەڵناو. چاوشین ≡ زاغ‌چشم

**چاوگ / çawig/**: ناو. ١. دەسەچیلە؛ دەستەچیلە ٢. وردە ئاگر لە کوانوودا ٣. *[ڕێزمان]* چاوگە؛ وشەیێ کە ناوی کارێکە و بەبێ لە بەر چاو گرتنی کەس و کات، جێبەجێ بوونی کارێک نیشان دەدا ≡ ١. افروزه ٢. بازماندەی اخگر در آتشدان ٣. مصدر

**چاوگا / çawga/**: ئاوەڵناو. *[پلار]* چاوزل؛ چاوگەورە ≡ گاوچشم؛ فراخ‌چشم

**چاوگر / çawgir/**: ئاوەڵناو. بەرچاو؛ بەرچاوگر ≡ چشمگیر

**چاوگرێدای / çawg(i)rêday/**: ئاوەڵناو. ١. چاوبەستراو ٢. *[کینایە]* تێنەگەیشتوو ≡ ١. چشم‌بسته ٢. ناآگاه

**چاوگل / çawgil/**: ناو. چاوئێشە ≡ چشم‌درد

**چاوگە / çawge/**: ناو. ١. دیمەن ٢. سەرچاوەی کانی ‹کانییەکەی گوڵبەند، خاوەن سەفا و زەوق/ چاوگەکەی دۆلاش وەک خولدی بەرین «قانع»› ٣. دەستەچیلە ٤. دەمی برین ٥. ☜ چاوگ ـ٣ ≡ ١. منظره ٢. سرچشمه ٣. افروزه ۴. سرِ زخم ۵. ☜ چاوگـ٣

⊡ **چاوگە داکەوتن**: چاوانە کردنەوە؛ چاوکە داکەفتن؛ قووڵ بوونی برین ≡ عمیق بودن زخم

**چاوگەورە / çawgewre/**: ☜ چاوگا

**چاوگێڕ / çawgêř/**: ئاوەڵناو. ١. چاولار؛ چاوچەپ‌وچێر ٢. *[مەجاز]* چاولەوەڕێن ≡ ١. لوچ ٢. چشم‌چران

**چاولار / çawlar/**: ☜ چاوگێڕـ١

**چاولەبەر / çawleber/**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* چاوشۆڕ؛ شەرمەزار ‹لە سایەی زەحمەتی قاچ و سەر و شان و دەس و ئەستۆم/ لە بۆ کەس چاولەبەر نیم و خەیاڵی ڕێی ڕیا ناکەم «قانع»› ≡ شرمنده

**چاولەبەرزی / çawleberzî/**: ئاوەڵناو. سەرت؛ بەرزەفڕ ≡ بلندپرواز

**چاولەدوا / çawled(i)wa/**: ☜ چاولەدوو

**چاولەدوو / çawledû/**: ئاوەڵناو. چاولەدوا: ١. بەئاوات ٢. چاوەڕێ ≡ ١. امیدوار ٢. چشم‌به‌راه

**چاولەدەر / çawleder/**: ☜ چاوەڕوان

**چاولەدەس / çawledes/**: ئاوەڵناو. مۆتاز؛ ئاتاج ≡ مُحتاج

**چاولەدەست / çawledest/**: ئاوەڵناو. ١. چاوەڕوانی بەخشش و خەلات ٢. *[کینایە]* ئاتاج ‹دەبوو ژوانگەی لە کن ڕاوگەی کەوان با/ نە وەک وا چاولەدەستی دەرکەوان با «هێمن»› ≡ ١. چشم به دست دیگران ٢. نیازمند

**چاولەدەستی / çawledestî/**: ناو. نیاز؛ ئاتاجی ≡ توقع؛ چشمداشت

**چاولەدەم / çawledem/**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* گوێڕایەڵ؛ بەرفەرمان ‹ئێستە بۆ وا ڕەبەن و داماوم؟/ من هەڵۆ چاو لە دەمی قالاوم! «سوارە»› ≡ مطیع

**چاولەوەڕێن / çawleweřên/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* تۆلاز؛ چاڤنۆک ≡ چشم‌چران

**چاولەوەڕێنی / çawleweřênî/**: ☜ چاوچەرێنی

**چاولێکەر / çawlêker/**: ☜ چاولێگەر

**چاولێکەری / çawlêkerî/**: ناو. چاولێگەری؛ هاڤرک ≡ چشم‌وهم‌چشمی

**چاولێگەر / çawlêger/**: ناو. چاولێکەر؛ خەرمێز؛ چاف‌کەرۆک؛ لاسایی‌کەرەوە ≡ مُقلِّد

**چاولێگەری / çawlêgerî/**: ☜ چاولێکەری

**چاوڵە / çawłe/**: ناو. ١. بزووت؛ ئەخترمە؛ چلووسک ٢. چالاو ≡ ١. نیمسوز ٢. چاه آب

**چاومار / çawmar/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* زۆر زرەنگ و وریا ≡ بسیار زیرک و باهوش

**چاومارە / çawmare/**: ناو. مارچێوە؛ مارگرە؛ مارچۆوە؛ گیاگوڵەنگ ≡ مارچوبه

**چاومەس** / çawmes/: ☜ **چاومەست**

**چاومەست** / çawmest/: ئاوەڵناو. چاومەس؛ چاوجوان «ئەختەر کچی کوردی چاومەستا! ئیلهامبەخشی شیعری پڕهەست! «هێمن»» ≡ خُمارچشم

**چاومێڵ** / çawmêł/: ناو. مێل؛ کلچێو ≡ میل سُرمەکشی

**چاونۆڕ** / çawnoř/: ☜ **چاوەڕوان**

**چاونە** / çawne/: ناو. ١. جێ چاو دانان لە ئامرازی وەک: میکرۆسکوپ و ... ٢. نیسکەی چکۆلە لە درگادا بۆ لێڕوانین ≡ ١و٢. چشمی

**چاونەبار** / çawnebar/: ئاوەڵناو. [کینایە] بەئێرەیی؛ بەرچاوتەنگ ≡ حسود

**چاونەترس** / çawnetirs/: ئاوەڵناو. [کینایە] چاونەترساو؛ ئازا؛ بەجەرگ؛ بوێر ≡ دلیر؛ بی‌باک

**چاونەترساو** / çawnetirsaw/: ☜ **چاونەترس**

**چاونەرم** / çawnerm/: ئاوەڵناو. [مەجاز] شەرمن؛ شەرمێون ≡ خجالتی

**چاونەزێر** / çawnezêr/: ئاوەڵناو. [مەجاز] ١. بەئێرەیی؛ چاوچنۆک ٢. ڕژد؛ دەس‌قووچاو؛ چکووس ≡ ١. حسود ٢. خسیس

**چاونەزێری** / çawnezêrî/: ناو. [مەجاز] ١. ئێرەیی؛ چاوچنۆکی «بڕۆ ڕێوی بەسیەتی چاونەزێری/ پەلاماری مەبە بۆ لانی شێری «هێمن»» ٢. ڕژدی؛ دەس‌قووچاوی ≡ ١. حسادت ٢. خسیسی

**چاونەکراوە** / çawnek(i)rawe/: ئاوەڵناو. [کینایە] بێ‌ئەزموون؛ ناآشنا به کار ≡ ناآزموده؛ بی‌تجربه؛ چشم و گوش بسته

**چاونهێر** / çawn(i)hêr/: ☜ **چاوەڕوان**

**چاونێر** / çawnêr/: ☜ **چاوەڕوان**

**چاووچڵە** / çaw û ç(i)łe/: ☜ **چاوچڵە**

**چاووڕاو** / çaw û řaw/: ☜ **چاوڕاو**

**چاوە** / çawe/: ناو. ١. دەستەچیلەی ئاگر ٢. ژووری خانوو ٣. کانی «لە ناو ئەو هەموو ئاوە، هەر چاوەیەک/ باوی هەنگاوی خۆشە/ بەتەنیا ئەوە شارەزای کۆسپ و کەندالی ڕێیە «سوارە»» ٤. یەکەیەک بۆ دووکان ٥. ڕیا؛ ڕووبینی ٦. کونی پلوورە هەنگ ٧. بەینی دوو کاریتە لە دارەڕادا ≡ ١. افروزه ٢. اتاق ٣. چشمه ۴. باب؛ واحد شمارش مغازه ۵. ریا ۶. سوراخ کندوی عسل ۷. فاصلەی دو بالار

**چاوەبرکە** / çawebiřke/: ☜ **چاوبرکە**

**چاوەبرکێن** / çawbiřkên/: ناو. چاوبرکێن؛ کاری چاوبرکە کردن ≡ اشارەی چشم

⊡ **چاوەبرکێن کردن** چاوقرتێ کردن؛ چاو قرتانن؛ چاو داگرتن «لە سەر گوێسوانە کردم چاوەبرکێن/ لەگەڵ گەورە کچی بەر دەرکی حەوشان «هێمن»» ≡ اشارە کردن با چشم

**چاوەپشیلە** / çawep(i)şîle/: ☜ **چاوپشیلە**

**چاوەپۆڕ** / çawepoř/: ☜ **چاوەسوێسکە**

**چاوەجاخ** / çawecax/: ناو. کوانوو ≡ اُجاق

**چاوەچاو**[1] / çaweçaw/: ناو. چاوەڵەچاو؛ کاری ڕوانین بە دڵنیگەرانییەوە؛ تماشای هەموو لا کردن ≡ عمل با نگرانی به هر سو نگریستن

⊡ **چاوەچاو بوون** بە چاو گەڕان و سەرەتاتکێ کردن «هەر چاوەچاومە بە تەمام یاری من کە بێ/ خۆم سەربڕم لە پێشی، گیان ڕەستگار ئەبێ «ئاوات»» ≡ به هر سو نگریستن

**چاوەچاو کردن** سەرنج دان و بۆ ئەم لا و ئەو لا ڕوانین «ئەی گیانەکەم بە چاوی ڕەشت سوێند ئەخوەم کە من/ بۆ دینی چاوی تۆیە کە هەر چاوەچاو ئەکەم «ئەحمەد موختار بەگ»» ≡ دید زدن

**چاوەچاو**[2]: ئاوەڵناو. چاوەڵچاو؛ چاو لە ڕێ «خاو و بێخاوی دوو زوڵفی خاوم ئەز/ چاوەچاوی یەک غەزالە چاوم ئەز «نالی»» ≡ چشم‌انتظار

**چاوە ـ چاوە** / çawçawe/: ئاوەڵناو. خان ـ خان؛

خانه_ خانه ⚑ شطرنجی

**چاوەچڕێ / çaweç(i)řê/:** ناو. *[مەجاز]* چاوچلێسی؛ تۆلازی ⚑ چشمچرانی

**چاوەچڵە / çaweç(i)łe/:** ناو. *[باوەڕی کۆن]* چاوەزار؛ چاوێنی؛ چاوچڵە ⚑ چشمزخم

**چاوەدوا / çawed(i)wa/:** ئاوەڵناو. *[کینایە]* چاولەدووا؛ دڵەودوا؛ دڵەدوا؛ دڵسوار؛ نیگەران ⚑ دلواپس

**چاوەدێر / çawedêr/:** ☜ **چاودێر**

**چاوەدێری / çawedêrî/:** ☜ **چاودێری**

**چاوەڕاو / çaweřaw/:** ناو. *[کینایە]* ١. کار و ڕەوتی چاو گێڕان و بە هەموو لادا ڕوانین ٢. چاوڕاو؛ شاتوشووت ‹یەکێ بە درۆ، یەکێ چاوەڕاو/ یەکێ بە ئاغام، پاشام هاتە ناو «پیرەمێرد»› ⚑ ١. عمل به دقّت نگریستن به هر سو ٢. لافوگزاف

**چاوەڕوان / çaweř(i)wan/:** ئاوەڵناو. چاوڕوان؛ چاوەڕێ؛ چاوەنوار؛ چاونۆڕ؛ چاوەنۆڕ؛ چاوەنوار؛ چەوەنۆڕ؛ چاونهێر؛ چاونێر؛ چاوەڕێگە؛ چەمەڕێ؛ چەمەڕا؛ چاڤڕێ؛ چاڤنێر؛ چەهڤنێر؛ چەشوەڕێ؛ چەشدار؛ چەشڕێ؛ چەوەڕێ؛ چاولەدەر؛ چاڤنهێر؛ دێرەدار؛ لهێڤ ‹زۆر دەمێکە چاوەڕوانی زرزرەی زنجیر ئەکەم/ سەیری ئەم زنجیرە کەن وەک زێوەری شاهانەیە! «قانع»› ⚑ چشمبراه

**چاوەڕوانی / çaweř(i)wanî/:** ناو. چاڤنێری؛ چاوەنواری؛ چاوەنۆڕی؛ چەمەڕایی؛ چاوەنواڕی؛ چەوەنواڕی؛ نەزاکە؛ نتر؛ تەماداری؛ چاڤنێری؛ چاوێڕوانی؛ ڕێپان؛ تەرنە؛ تەمایەری؛ چەوچەوی؛ کوترمە؛ چاوەڕێیی: ١. کار و ڕەوتی چاوەڕوان بوون ‹دوای دوو مانگ چاوەڕوانی جوابیان دام› ٢. هیوا ‹چاوەڕوانییەکانی نەهاتنە دی› ⚑ ١. انتظار ٢. توقع

**چاوەڕوو / çaweřû/:** ناو. *[مەجاز]* فهێت؛ فەدی؛ حەیا؛ شەرم ⚑ آزرم

**چاوەڕەشە / çaweřeşe/:** ناو. یەکەم توێ لە قوڕی بانەناو ⚑ لایەی اول گلاندود بام

**چاوەڕێ / çaweřê/:** ☜ **چاوەڕوان**

**چاوەڕێگە / çaweřêge/:** ☜ **چاوەڕوان**

**چاوەڕێیی / çaweřêyî/:** ☜ **چاوەڕوانی**

**چاوەزار / çawezar/:** ناو. *[باوەڕی کۆن]* چاوزار: ١. چاوێنی؛ چەمەزەخم؛ چەمەزەخمە؛ چاوچڵە؛ زیانێک کە پێیان وایە بە هۆی چاو لێدانەوە تووشی کەسێک دەبێت ‹شارێکە عەدل و گەرمە، لە جێگێکە خۆش و نەرم/ بۆ دەفعی چاوەزارە دەڵێن: شاری شارەزوور «نالی»› ٢. نووشتە بۆ چارەی دەرد لە چاوی پیس ⚑ ١. چشمزخم ٢. چشمارو

**چاوەسوێسکە / çawes(i)wêske/:** ناو. چاوەسووسکە؛ چاوەپۆڕ؛ گیایەکە ⚑ گیاهی است

**چاوەسووسکە / çawesûske/:** ☜ **چاوەسوێسکە**

**چاوەش / çaweş/:** ناو. ١. زوڕناژەن؛ موتریب ‹یەکێک بووە لۆتی و یەک بوو بە چاوەش/ یەکێک بووە سوالکەر، یەک بوو بە جاکەش! «هێمن»› ٢. سەردەستەی بیست کەس لە لەشکری عوسمانیدا ⚑ ١. رامشگر ٢. سردستەی یک واحد بیست نفری در ارتش عثمانی

**چاوەقووڵە / çaweqûłe/:** ☜ **چاوقووڵکە**

**چاوەقووڵی / çaweqûłî/:** ☜ **چاوقووڵکە**

**چاوەگا / çawega/:** ناو. گیایەکە گوڵێکی زەردی ناوسپی دەکا ⚑ گیاهی است

**چاوەگێڕان / çawegêřan/:** چاوگ. چاو گەڕاندن؛ بە هەموو لایەکدا ڕوانین ⚑ به هر سو نگریستن

**چاوەڵچاو / çawełçaw/:** ☜ **چاوەچاو**

**چاوەناز / çawenaz/:** ناو. ١. مەودای دیتنی چاو ٢. ☜ **چاوەنداز** ⚑ ١. دیدرس ٢. ☜ **چاوەنداز**

▣ **چاوەناز بڕیان:** توانا و هەلی دیتن نەمان ‹تاریکی کرد و چاوەناز بڕیا› ⚑ دید نماندن

**چاوەنداز / çawendaz/:** ناو. *[کینایە]* چاوەناز؛ دیمەن؛ بەرجەوەن؛ بەرژەوەن؛ چاوگە؛ بەرچاو ⚑

چشم‌انداز

**چاوەنوار / çawen(i)war/:** ☜ **چاوەڕوان**

**چاوەنواری / çawen(i)warî/:** ☜ **چاوەڕوانی**

**چاوەنوار / çawen(i)wař/:** ☜ **چاوەڕوان**

**چاوەنواڕی / çawen(i)wařî/:** ☜ **چاوەڕوانی**

**چاوەنۆڕ / çawenoř/:** ☜ **چاوەڕوان**

**چاوەنۆڕی / çawenořî/:** ☜ **چاوەڕوانی**

**چاویار / çawyar/:** ناو. ١. ☜ **چاودار‌ـ١** ٢. ☜ **چاودێر**

**چاویاری / çawyarî/:** ☜ **چاودێری**

**چاویڕوانی / çawîřwanî/:** ☜ **چاوەڕوانی**

**چاویش / çawîş/:** ناو. ١. نازناوی پیاوی گەورەی ئاینی یەزیدییەکان ٢. چاوەش؛ سەردەستەی سەربازانی عوسمانی ☵ ١. لقب روحانی ایزدی ٢. چاوش؛ سردسته‌ای در ارتش عثمانی

**چاویلکە / çawîlke/:** ناو. چاویلە: ١. چاڤک؛ چەشمەک؛ چەعفک؛ چەعفک؛ گوێزلک؛ گۆزلک؛ عەینەک ‹ئێستا پیرم و کەوتوومەتە ئاویلکە/ چاوی جوانم لێون دەکا چاویلکە «هێمن»› ٢. نەخۆشییەکە بەلەکی نەخۆش پۆرگ دەردەکات ☵ ١. عینک ٢. بیماری تاول ساق پا

**چاویلکەدان / çawîlkedan/:** ناو. جزمە و قوتووی جێگای چاویلکە ☵ قاب عینک

**چاویلکەیی / çawîlkeyî/:** ئاوەڵناو. عەینەکی؛ چاڤکی؛ بەرچاڤکی ☵ عینکی

**چاویلە / çawîle/:** ☜ **چاویلکە**

**چاوێر / çawêr/:** ☜ **چاودێر**

**چاوێری / çawêrî/:** ☜ **چاودێری**

**چاوێشە / çawêşe/:** ☜ **چاوئێشە**

**چاوێنی / çawênî/:** ناو. *[باوەڕی کۆن]* چاوەزار ☵ چشم‌زخم

**چای[1] / çay/:** ناو. چا؛ چایی؛ چایە؛ چەی؛ چوی؛ تۆچا: ١. ڕووەکی چای؛ گیایەکە لە ڕەگەزی چای بە گەڵای قنج و پڕ و بێ‌کوڵک و ڕەنگی سەوزی تۆخەوە کە بۆ خواردنەوە بەرهەمی دێنن ٢. گەڵای چای؛ گەڵای وشک‌کراوی چای ‹نیو کیلۆ چای بکڕە!› ٣. چای دەمکراو؛ هوونک؛ هنک؛ دەمکراوی گەڵای چای لە ئاوی کوڵهاتوودا کە بە گەرمی دەیخۆنەوە ‹پیالەیەک چای داکە!› ☵ ١. گیاه چای ٢. چای خُشک ٣. چای دم کرده

▣ **چای تاڵ:** ١. چایی شەکر تێ نەکراو ٢. چای ڕەش ☵ ١. چای تلخ ٢. چای پُررنگ

**چای خەست:** چایی شەکر تێکراو ☵ چای شیرین

**چای دیشلەمە:** چایی شەکر تێ‌نەکراو کە بە قەندەوە دەخورێ ☵ چای قندپهلو

**چای ڕەش:** ☜ **چای تاڵ ـ٢**

**چای سەفەری:** ☜ **چای کیسەیی**

**چای کیسەیی:** چای سەفەری؛ ئاردە چای لە کیسە کراو بۆ خێرا ئامادە کردنی چای ☵ چای کیسه‌ای

**چای[2]:** ☜ **چیاگ**

**چای‌پارزن / çayparzin/:** ☜ **چاپاڵێو**

**چایچی / çayçî/:** ناو. چاچی؛ چاییچی: ١. چاپەز؛ خاوەن چایخانە ٢. کەسێ کە چای تێدەکا ☵ ١و٢. چایچی

**چایخانە / çayxane/:** ناو. چاخانە؛ قاوەخانە؛ شوێنی گشتی بۆ چای خواردنەوە ☵ چایخانه

**چایدان / çaydan/:** ناو. قۆری ☵ قوری

**چایر/ çayir/:** ناو. ١. ☜ **چایەر** ٢. ☜ **چارشێو‌ـ١**

**چایرنشین / çayirn(i)şîn/:** ☜ **چادرنشین**

**چایگ / çayig/:** ☜ **چیاگ**

**چایگی / çaygî/:** ناو. ساردی؛ سەردی؛ چیاگی ☵ سردی

**چایمانی / çaymanî/:** ناو. چیامانی: ١. نەخۆشی لە سەرماوە ٢. ئارەقەی ساردی لەش ☵ ١. سرماخوردگی ٢. عرق سرد بدن

**چایه / çaye/:** ☜ **چای**[1]

**چایەر / çayer/:** ناو. چایر؛ لەوەڕگە ‹سۆفی ڕیایە خەڵوەتی، بێنی بەهاری کرد/ هاتە دەرێ لە سایەیی چایەر، حەسایەوە «نالی»› ≡ مرتع

**چایی**[1] **/ çayî/:** ☜ **چای**[1]

**چایی**[2]**:** ☜ **چیاگ**

**چاییپارزن / çayîparzin/:** ☜ **چاپاڵێو**

**چاییپاڵێو / çayîpałêw/:** ☜ **چاپاڵێو**

**چاییچی / çayîçî/:** ☜ **چایچی**

**چاییخۆر / çayîxor/:** ئاوەڵناو. چاخۆر؛ خووگرتوو بە خواردنەوەی چای ≡ چایخور

**چاییخۆری / çayîxorî/:** ئاوەڵناو. پێوەندیدار بە چایی خواردنەوە ‹پیالەی چاییخۆری› ≡ چایخوری

**چاییدان / çayîdan/:** ☜ **چارێز**

**چایین / çayîn/:** چاوگ. سەرما بوون؛ ڕچیان ≡ چاییدن

**چپ / çip/:** دەنگەناو. ۱. دەنگی داکەوتنی دڵۆپە ۲. سرتە؛ چپە؛ قسە بە دەنگی نزم ≡ ۱. صدای چکە ۲. پچ‌پچ

**چپان / ç(i)pan/:** چاوگ. سرتە کردن ≡ پچ ـ پچ کردن

**چپاندن / ç(i)pandin/:** چاوگ. چپانن؛ سرکە کردن؛ بە سرتە قسە کردن ≡ دِرگوشی گفتن

**چپانن / ç(i)panin/:** ☜ **چپاندن**

**چپ ـ چپ / çip çip/:** ☜ **چپەچپ**

**چپخوز / çipxuz/:** ئاوەڵناو. ڕژد؛ چکووس ≡ خسیس

**چپڕ / çipiř/:** ناو. لێرەواری چڕ ≡ بیشەی انبوە

**چپک / çipik/:** ناو. لکی تازە دەرهاتووی ناسک ≡ شاخەی نورستە

**چپنای / çipnay/:** چاوگ. چپاندن ≡ دِرگوشی گفتن

**چپوهۆڕ / çip û hoř/:** دەنگ. سرتە و خورتەی زۆر ≡ پچ ـ پچ زیاد

**چپە / ç(i)pe/:** دەنگەناو. ۱. سرتە؛ سرکە ‹چپە یا بۆ حیزبیە یا بۆ دزی «مەسەل»› ۲. دەنگی دڵۆپە داکەوتن ≡ ۱. پچ‌پچ ۲. صدای چکیدن قطره

**چپەچپ / ç(i)peçip/:** دەنگەناو. چپ‌ـ‌چپ: ۱. سرتە و سرکەی زۆر ۲. دەنگی لە سەر یەکی داکەوتنی دڵۆپە ≡ ۱. پچ‌پچ بسیار ۲. صدای چکەی پیاپی

**چت / çit/:** ناو. شت؛ تشت ≡ چیز

**چتارە / ç(i)tare/:** ناو. ئەستێرە؛ هەسارە ≡ ستارە

**چتر / ç(i)tir/:** ناو. ڕێوی؛ ڕواس ≡ روباه

**چتری / çitrî/:** ناو. سەندەڵی؛ سەنگەڵی؛ ئەسکەمل ≡ صندلی

**چتومەک / çit û mek/:** ☜ **شتومەک**

**چتۆ**[1] **/ ç(i)to/:** ئاوەڵناو. چتۆڤ؛ چۆن؛ چلۆن؛ کوو ‹ئەم کریکارە کاری چتۆیە؟› ≡ چگونە

**چتۆ**[2]**:** ئاوەڵکار. چتۆڤ؛ چۆن؛ چلۆن؛ کوو ‹ئەم کریکارە چتۆ کار دەکا؟› ≡ چطور

**چتۆڤ / ç(i)tov/:** ☜ **چتۆ**

**چتۆنە / ç(i)tone/:** ئاوەڵکار. چۆن؛ چلۆن ≡ چطور

**چتوور / ç(i)tûr/:** ☜ **چوێشتیر**

**چتیر / ç(i)tîr/:** ☜ **چوێشتیر**

**چجار / çicar/:** ئاوەڵکار. قەت؛ قەد؛ هیچگا؛ هەرگیز ≡ هیچگاە

**چجای / çicay/:** سارستە. بە شێوەی پرسیاریێ دەگوترێ کە وەڵامەکەی سەلماوە ‹خێوی هەریەک لەو خدانە/ نیوی بەدوور لە نەمانە// چجای کە گشت لای یەکێ بێ/ دەبێ ئەو هەرژیوە کێ بێ؟ «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ≡ چە جای آن کە

**چچک / çiçik/:** ناو. ۱. گوان؛ گوهانی مێوینە ۲. گۆی سەر مەمک ۳. میتکە؛ بەلۆکە ≡ ۱. پستان ۲. نُک پستان ۳. چچولە

**چخ / çix/:** دەنگ. چخە؛ وشەی دەرکردنی سەگ ≡ چخە؛ کلمەی راندن سگ

**چخنای / çixnay/**: چاوگ. وەڕین؛ حەپە کردن ☰ پارس کردن

**چخە / ç(i)xe/**: ☜ **چخ**

**چرا / ç(i)ra/**: ناو. چراو: ١. کەرەسەیەک کە بە سووتاندنی سووتمان، ڕووناکی بەدی دێنێ ‹چرای تۆڕی› ٢. دەزگایەک کە بە هۆی هێزی کارەباوە ڕووناکی بەدی دێنێ ‹چرای بەرق› ٣. گلۆپ؛ لامپ ٤. وجاخی نەوتی ☰ ١تا٣. چراغ

▣ **چرا بزن**: چرایەکی قەدیمی، بە فتیلە و شیلەی گەرچەک هەڵدەکرا ☰ چراغ روغنی

**چرا پەمپی**: ☜ **چرا تۆڕی**

**چرا تۆڕی**: چرا پەمپی؛ چرایەکی نەوتی بە تۆڕ و پەمپەوە ☰ چراغ زنبوری

**چرا خەو**: شەوخەف؛ چرایەکی کز کە کاتی خەوتن هەڵدەکرێ ☰ چراغ خواب

**چرا دەسی**: ☜ **چراموشی**

**چرا فتیلە**: ☜ **چراموشی**

**چرا قووە**: لایت؛ جۆرێ چرای دەستی کە بە پیل کار دەکا ☰ چراغقوه

**چرا لامپا**: جۆرێ چرای گڕسۆز بە کاسەیەک جێ سووتەمەنی و دڵۆپێکەوە ☰ چراغ کاسەای

**چرا موشی**: چرادەسی؛ قوتیلە؛ قوتیللە؛ قوتیلەچرا؛ چرافتیلە ☰ چراغموشی

**چرای جادوو**: *[مەجاز]* شتێ کە هەموو ئاواتێ بەجێ دێنێ ☰ چراغ جادو

**چرای سوور**: ١. چرایەک کە نیشانەی مەترسی یان بەسیانی ڕێگەیە ٢. چرایەک کە ڕووناکییەکەی سوورە و بۆ ڕاگەیاندنی مەترسی بە کار دەچێ ☰ ١. چراغ قرمز ٢. چراغ خطر

**چرای سەوز**: چرایەک کە نیشانەی ئازادی هاتوچووە ☰ چراغ سبز

**چرای گڕسۆز**: چرایەکی نەوتی بە فتیلەی خڕەوە ☰ چراغ گردسوز

▣ **چرا دان**: ١. ڕۆشن کردنی چرا ٢. بە چرا ڕۆشن کردن، عەلامەت دان ☰ ١. روشن کردن چراغ ٢. علامت دادن

**چراتۆڕی / ç(i)ratořî/**: ناو. چرایەکی نەوتی بە تۆڕ و پەمپەوە ☰ چراغ زنبوری

**چراچی / ç(i)raçî/**: ناو. ١. ئەوی چرا لە پێش بووک هەڵدەگرێ ٢. خزمەتکاری ماڵەگەورە کە چرا هەڵکردنی بە دەستە ‹وا تێدەگەم لە بەزمی چەمەندا چراچییە/ لالە کە ڕۆنی شەونمی کردە چرایەوە «قانع»› ☰ ١. چراغ بە دست پیشاپیش عروس ٢. چراغچی

**چراخ**[1] **/ ç(i)rax/**: ناو. ١. پشت و پەنا؛ پشتیوان؛ پشتگر ‹کوێرەکانییان مەکەن بە باخ! ناکەسبەچان مەکەن بە چراخ! قەت لە پاشی چوان مەڵێن ئاخ! «مەسەل»› ٢. *[کینایە]* زاوا ☰ ١. پشتیبان ٢. داماد

**چراخ**[2]: ئاوەڵناو. *[کینایە]* ١. بەکەیف و دەماخ ٢. تورت و تێراو ٣. وریا و بەهۆش ☰ ١. سرحال ٢. شاداب ٣. هُشیار

**چراخان**[1] **/ ç(i)raxan/**: ناو. ١. چراخانی؛ کاری چرا هەڵکردن لە بازاڕ و شارا بۆ شادی ٢. دەمی دەم دانەوەی پشکۆژ ☰ ١. چراغانی ٢. موسم شکفتن شکوفه

▣ **چراخان کردن**: ١. ڕۆشن کردنی چرای زۆر و جۆراوجۆر ٢. دەمدانەوەی بە کۆمەڵی چرۆ ☰ ١. روشن کردن چراغهای زیاد ٢. شکفتن یکبارەی شکوفەها

**چراخان**[2]: ئاوەڵناو. شەوگڕ؛ مەشخەلان؛ بە چراگەلی ڕۆشنی زۆرەوە ☰ چراغان

**چراخانی / ç(i)raxanî/**: ☜ **چراخان**[1]**ـ١**

**چراخپا / ç(i)raxpa/**: ناو. دۆخ یان چۆنیەتی هەڵبرینی دوو دەست و ڕاوەستانی گیانەوەر بە سەر هەر دوو پێیەوە ☰ چراغپا

**چراخ پێ / ç(i)raxpê/**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* تەورە ‹بۆ

خێرا چراغ‌پێ دەبی؟ چی گوت لێ‌چراخ‌پـێ بـووی؟›
☰ عصبانی

**چراخەو / ç(i)raxew/**: ناو. شەوخەف؛ شەوخەو ☰ چراغ خواب

**چرادان / ç(i)radan/**: ناو. ١. جێ‌چرا؛ شوێن یان شتی چرا لە سەر دانان ٢. تاقەیەکی تایبەت بۆ چرادانان لە دیواری ماڵی قەدیم، زیاتر بە شێوەی کەللە قەند چێ دەکرا تا دووکەڵەکەی هەڵکێشێ ☰ ١. چراغپایە ٢. چراغدان

**چرادەستی / ç(i)radestî/**: ناو. دەستەچرا؛ فانۆس؛ فەنەر ☰ فانووس

**چرادەسی / ç(i)radesî/**: ☜ **چرا مووشی**

**چراساز / ç(i)rasaz/**: ناو. کەسێ کە پیشەی چێ کردن یان دروست کردنەوەی چرایە ☰ چراغ‌ساز

**چراغ / ç(i)rağ/**: ناو. /کینایە/ ١. ماڵەگەورە ٢. زاوا؛ چراخ ☰ ١. خاندان بزرگ ٢. داماد

**چراغی / ç(i)rağî/**: ناو. /کینایە/ خزمایەتی دەگەڵ گەورەماڵان ☰ خویشاوندی با بزرگان

**چرافتیلە / ç(i)raf(i)tîle/**: ☜ **چرا مووشی**

**چراڤ / ç(i)rav/**: ناو. زنە؛ زەل؛ باتلاغ ☰ باتلاق

**چراکەران / ç(i)rakeran/**: ناو. وەختی شێوان؛ دەمی چرا هەڵکردن؛ تەنگی نوێژی شێوان ☰ شامگاه

**چراو / ç(i)raw/**: ناو. چرا؛ ڕووناکیدەری تاریکی ☰ چراغ

**چراوک / ç(i)rawik/**: ☜ **چراوڵە**

**چراوگ / ç(i)rawig/**: ☜ **چراوڵە**

**چراوڵە / ç(i)rawłe/**: ناو. چراوک؛ چراوگ؛ چۆڵەچرا؛ ئەختەرمە؛ شەڕەی گڕگری لە دارەوە پێچراو کە لە چرای دەستهەڵگر دەچێ ☰ مشعل

**چراوی / ç(i)rawî/**: ناو. چرا ☰ چراغ

**چراویلێ / ç(i)rawîlê/**: ناو. گوپ؛ لوور؛ بە تەوژم لە سەرڕا هاتنە خوار بە شێوەیی کە دەست و سەر بەرەوخوار بێ ☰ شیرجە

**چرپ[1] / çirp/**: ناو. جۆرێ دزی؛ کاری ڕفاندن ☰ عمل قاپیدن

**چرپ[2]**: دەنگ. دەنگی شکانی داری ناسک ☰ صدای شکستن چوب نازک

**چرپا / çirpa/**: ☜ **چەرپا**

**چرپان / çirpan/**: چاوگ. ١. چپان؛ چپە کردن ٢. شلەژان؛ سەر لێشێوان ☰ ١. پچ‌پچ کردن ٢. آشفتن

**چرپاندن / çirpandin/**: چاوگ. تێنەپەڕ. تێپەڕ. //چرپاندت؛ دەچرپێنی؛ بچرپێنە// چرپانن: □ تێنەپەڕ. ١. سرکە کردن؛ بە سرتە قسە کردن □ تێپەڕ. ٢. ڕفاندن ٣. فێڵ کردن ☰ ١. پچ‌پچ کردن ٢. چاپیدن ٣. فریب دادن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەچرپاندن

**چرپانن / çirpanin/**: ☜ **چرپاندن**

**چرپایە / çirpaye/**: ☜ **چەرپا**

**چرپنای / çirpnay/**: چاوگ. بە پەلە ڕۆیشتن ☰ شتافتن

**چرپوچاپ / çirp û çap/**: ناو. ١. شاتوشووت؛ کاری خۆ هەڵکێشان؛ بە خۆدا هەڵگوتن ٢. تالان و بڕۆ ☰ ١. لاف‌وگزاف ٢. چپاول

**چرپوهۆڕ / çirp û hoř/**: دەنگەناو. سرتەی زۆر ☰ پچ‌پچ زیاد

**چرپە[1] / çirpe/**: ناو. کاری خۆ شاردنەوە بە گەلا و چرپی لە سەردان لە شەڕدا، بۆ دوژمن فریودان ☰ استتار با شاخ و برگ درختان در جنگ

**چرپە[2]**: دەنگەناو. ١. دەنگێکی سەبر ‹دێ و دەچێ بێ‌هەست و چرپە، بە بێ خورپە، وەکوو مام ڕێوی، وەک گورپە! «هەژار، *چوار ناملکە*»› ٢. سرتە؛ سرکە ‹کوانێ موحیبەت دوعا و پەیامت؟/ کوا چرپە و سروەی شیرین کەلامت؟ «قانع»› ☰ ١. صدای

بسیار آرام ۲. پچ‌پچ

**چرپەچرپ / çirpeçirp/**: دەنگەناو. ۱. دەنگەدەنگی هێواش ۲. سرکەسرک؛ سرتەسرت ☰ ۱. صداهای آرام ۲. پچ‌پچ

**چرپی / çirpî/**: ناو. لق‌وپۆی بڕدراو ☰ شاخەهای هرس‌شده

**چرت / çirt/**: ☜ **چۆرت[1]_۲**

**چرتان / çirtan/**: چاوگ. چرتیان؛ چورتان: ۱. کاری وەک ترازانی پەلەپیتکەی چەکی گەرم ۲. لەجێ چوون ☰ ۱. چکانده شدن (ماشه و ...) ۲. از جا دررفتن

**چرتاندن / çirtandin/**: چاوگ. چورتاندن؛ چورتانن؛ چرتانن: ۱. قرتە لێ‌هێنان؛ ترازاندنی وەک پەلەپیتکەی چەکی گەرم ۲. ترووکاندن؛ تووکاندن ۳. هەڵپەرتاوتن؛ هەڵپاچین ٤. دانە داوەوە؛ دانە تەڵەوە ☰ ۱. چکاندن (ماشە و ...) ۲. شکستن (تخمە و ...) ۳. هَرَس کردن ۴. لو دادن

**چرتانن / çirtanin/**: ☜ **چرتاندن**

**چرتک / çirtik/**: ناو. قەلەمباز؛ بازی گوشاد ‹لۆتک و چرتک داڤێتن› ☰ پرش

**چرتکەمیز / çirtkemîz/**: ☜ **میزەچورتکێ**

**چرتون / çirtun/**: ناو. تەندوورەی ئاش ☰ تنورەی آسیاب

**چرتە[1] / çirte/**: ناو. چورتە؛ جوولەی زۆر کەم ☰ تپش و تکان بسیار کم

**چرتە[2]**: دەنگەناو. چورتە؛ دەنگی زۆر کەم ☰ صدای بسیار آرام

**چرتەچرت / çirteçirt/**: دەنگەناو. ۱. دەنگەدەنگی سەبری سەعات ۲. دەنگی وەک شکانی چرپیی میچ ☰ ۱. صدای تیک ـ تیک ساعت ۲. صدای آرام شکستن چیزی

**چرتەمیزە / çirtemîze/**: ناو. چرکەمیزە؛ میزەچوتکە؛ مێزەچورتکە؛ گمێزەچۆرتکێ؛ نەخۆشی میز ڕانەگرتن ☰ چکمیزک

**چرتی / çirtî/**: ئاوەڵناو. دانەسکناو؛ بەهەڵبەزودابەز؛ هاروهاج؛ بزۆزی هەدا نەدەر ☰ ناآرام

**چرتیان / çirt(i)yan/**: چاوگ. ۱. دەرپەڕین ۲. خۆ ون کردن بە هەڵاتن ☰ ۱. برجهیدن ۲. دررفتن

**چرچ[1] / çirç/**: ناو. ۱. لەرز لە بەر سەرما یان لە ترسان ۲. لۆچی بە سەر یەکا هاتوو ☰ ۱. لرزش بدن بر اثر سرما و یا ترس ۲. چین و چروک

**چرچ[2]**: ئاوەڵناو. ۱. سیس؛ ژاکاو ۲. لەڕ؛ لاواز ۳. لۆچ ‹یەک ماچی دەدان لە دەستی چرچی/ یەک بۆنی دەکرد لە تیسکی پرچی «هەژار، *مەم‌وزین*»› ☰ ۱. پژمُرده ۲. لاغر ۳. چروکیده

◘ **چرچ بون**: چرچ هەڵاتن؛ ژاکان؛ ژاکیان؛ پەژمەران؛ سیس بوون؛ هەڵقرچان؛ لۆچ بە سەر یەکا هاتن ☰ چروکیدن

**چرچ هەڵاتن**: ☰ ☜ **چرچ بون**

**چرچان / çirçan/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //چرچای؛ دەچرچێی؛ بچرچێ// چرچ و لۆچ بوون ☰ چروکیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: چرچاو/ چاوگی نەرێنی: نەچرچان

**چرچاندن / çirçandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //چرچاندت؛ دەچرچێنی؛ بچرچێنە// ژاکاندن؛ ژاکانن؛ سیس کردن ☰ پژمُرده کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەچرچاندن

**چرچاو / çirçaw/**: ئاوەڵناو. ژاکاو؛ قەرمچی؛ سیس‌هەڵگەڕاو ☰ پژمُرده

**چرچرۆ / çirç(i)ro/**: ناو. سیسرک؛ سفرەبڕ ☰ جیرجیرک

**چرچرو / çirç(i)rû/**: ناو. سیسرە؛ سیسرک ☰ جیرجیرک

**چرچسین / çirç(i)sîn/**: چاوگ. داچڵەکین ☰ یکه خوردن

**چرچلابەر** / çirçlaber/: ناو. ئوتوو؛ تووز؛ دەقاق؛ ناوەشکێنە 🇮🇷 اتو

**چرچنای** / çirçnay/: چاوگ. چرچ کردن 🇮🇷 چروکاندن

**چرچولۆچ**[1] / çirç û loç/: ناو. چۆنیەتی ژاکان و بەسەر یەکا هاتنی لۆی پێست 🇮🇷 چین‌وچروک

**چرچولۆچ**[2]: ئاوەڵناو. سیس و ژاکاو؛ هەڵقرچاو ‹لامل چرچولۆچ، هەموو کوورە پشت/ خۆیان ئەدۆزی و ئەسپێیان ئەکوشت! «قانع»› 🇮🇷 چروکیده

**چرچە**[1] / çirçe/: ناو. جۆرێ ترێ 🇮🇷 نوعی انگور

**چرچە**[2]: ئاوەڵناو. *[پلار]* لاواز و ژاکاو ‹باپیرە چرچە وەک دار چەقیبوو/ دەمی وەک تەڵە پێکدا تەقیبوو «هەژار، *بۆکوردستان*»› 🇮🇷 لاغر و دژم

**چرچی** / çirçî/: ناو. ١. ژاکاوی ٢. لاوازی 🇮🇷 ١. چروکیدگی ٢. لاغری

**چرچیاگ** / çirç(i)yag/: ئاوەڵناو. قەرمچی؛ کرژ؛ چرچاو 🇮🇷 چروکیده

**چرچیان** / çirçyan/: چاوگ. ژاکان؛ هەڵقرچان 🇮🇷 چروکیدن

**چرچیای** / çirçyay/: چاوگ. چرچ بوون 🇮🇷 چروکیدن

**چرخوویس** / çirxûys/: ☜ **چرخیس**

**چرخیس** / çirxîs/: ناو. چرخوویس؛ ئاردی دانەوێڵە لە ڕۆندا سوورەوەکراو 🇮🇷 کاچی

**چردانە** / çirdane/: ئاوەڵناو. داندار؛ دانار؛ پڕبار (دانەوێڵە) 🇮🇷 پُردانە (غلە)

**چرزەڵە** / çirzeɫe/: ناو. چووزەڵە؛ چووزەرە 🇮🇷 نیش گیاه

**چرژ** / çirj/: ئاوەڵناو. پرژ و بلاو 🇮🇷 پخش و پَلا

**چرژانە** / çirjane/: ناو. حاڵەتی مرۆچانە کردنی پێستی سارد، دوای گەرم بوونەوە 🇮🇷 مور ـ مور

**چرسان** / çirsan/: چاوگ. ترووسکان 🇮🇷 سوسو کردن

**چرسک** / ç(i)risk/: ناو. ترووسک؛ تروووسکە 🇮🇷 سوسو

**چرسکانەوە** / ç(i)riskanewe/: چاوگ. تروووسکانەوە 🇮🇷 سوسو کردن

**چرسین** / çirsîn/: چاوگ. ١. ڕەشکە و پێشکە کردنی چاو ٢. تروووسکان 🇮🇷 ١. سیاهی رفتن چشم ٢. سوسو کردن

**چرغ** / çirğ/: ناو. جۆرێ تەشی بۆ خوری ڕستن 🇮🇷 نوعی دوک

**چرف** / çirf/: ناو. ١. پت؛ نەبز؛ لێدانی ڕەگ ٢. ڕەوتی بریقانەوەی برووسکە 🇮🇷 ١. نبض ٢. درخشش برق

**چرڤ** / çirv/: ئاوەڵناو. شێواو؛ پرژ و بلاو 🇮🇷 درهم‌برهم

**چرڤراندن** / çirv(i)randin/: چاوگ. بلاو و پەرێشان کردن 🇮🇷 پراکندن

**چرڤری** / çirv(i)rî/: ناو. بلاوی 🇮🇷 پراکندگی

**چرقە** / çirqe/: دەنگ. قرچە؛ دەنگی شکانی دار 🇮🇷 قرچ

**چرک** / çirk/: ناو. ١. چلک؛ قریژ؛ گەماری ٢. کێم و زووخاوی برین ٣. داری دەستی هەلاج ٤. شاهۆ؛ باڵدارێکی دەم‌ئاوانە ٥. ☜ **چرگ** 🇮🇷 ١. چرک بدن ٢. چرک زخم ٣. چوب دست پنبەزن ٤. بوتیمار ٥. ☜ **چرگ**

**چرکان** / çirkan/: چاوگ. تکان؛ چکە/ تکە کردن 🇮🇷 چکیدن

**چرکاندن** / çirkandin/: چاوگ. تێپەڕ. //چرکاندت؛ دەچرکێنی؛ بچرکێنە// چرکانن: ١. چرتاندن؛ پەلەپیتکەی کەرەستەیەک ترازاندن ٢. دڵۆپە کردن (سەربان و...) ٣. کاری وەک لۆکە بەهەلاجی کردن 🇮🇷 ١. چکاندن (ماشە) ٢. چکە کردن ٣. پنبە زدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەچرکاندن

**چرکانن** / çirkanin/: ☜ **چرکاندن**

**چرکن** / çirkin/: ئاوەڵناو. گـەمار؛ چڵـکن؛ پـیس و پۆخڵ ≌ چرکین

**چرکنـای** / çirknay/: چاوگ. چرکاندن ≌ چکانـدن (ماشه)

**چرکونـه** / çirkûne/: نـاو. شـوانخڵـەتێنه؛ شـوانخەڵـەتێن؛ شـوانهەڵخڵـەتێنه؛ شڤـانکوژ؛ شوانەخەڵەتن؛ شڤان‌خـاپێن؛ مـەلێکی پچـووکی بۆرەڵۆکەیە لە پاساری گەورەتر ≌ شبان‌فریبک

**چرکـه** / çirke/: نـاو. جرکـە: ۱. سـانیە؛ یەکـەی سەرەکی بژاردنی کات، بەرانبەر بە ۱/٦۰ خولەک (دەقیقه) و ۱/۸٦٤۰۰ شەو و ڕۆژێک ‹ڕەنگە دوای یـەک چرکـەی تـر مـن/ بگوێزمـەوە و بـڕۆم/ بچمـە ولاتێکی دیکەی جوانی «شێرکۆ»› ۲. *[کینایه]* سات؛ کاتێکی زۆر کورت ۳. کەمترین دەنگ ‹چرکـەت بێ دەتکوژم!› ٤. کـەمترین بـزاو ‹لـە جـێ خـۆت دانیشه چرکە مەکە!› ≌ ۱و۲. ثانیه ۳. کمترین صـدا ۴. کمترین حرکت

**چرکەچرک** / çirkeçirk/: دەنگەناو. ۱. دەنگەدەنگی دڵۆپە ۲. قرچەقرچی ئاڵۆداری میچ ≌ ۱. صـدای چکیدن آب ۲. جیرجیر چوب‌های سقف

**چرکـەژمێر** / çirkej(i)mêr/: نـاو. میلـەی چرکـە ژماردنی کاتژمێر ≌ ثانیه‌شمار

**چرکـەمیزە** / çirkemîze/: نـاو. چرتـەمیزە ≌ چکمیزک

**چرکیان** / çirkyan/: چاوگ. بـزووتن؛ جـووڵان ≌ تکان خوردن

**چرکیانـەوە** / çirkyanewe/: چـاوگ. چرکیـان و بزووتنی لەسەر یەک ≌ تکان خوردن پیاپی

**چرکیـای** / çirkyay/: چـاوگ. چرکـان ≌ چکانـده شدن (ماشه و ...)

**چـرگ** / çirg/: نـاو. چـرک؛ چێـرگ؛ چێـڕگ؛ مێشەسێ؛ باڵندەی ویشکانین، لە دەشتی پـڕگیا و زەویوزاران دەژین، لاق و ملیان درێژ و باڵـیان گەورە و دەندووکیان ئەستوور و پانـە، لـە فڕینـدا تەپن، لە باتی سیکەتۆرە ورگیان هەیە، لە ڕووتەن و زەوی تەنک هێلانە ساز دەکەن، بەهاران کاتی جـووت بـوون نێرەکـەیان چـەتر هەڵـدەدا و بـە دەوری خۆیـدا دەسـووڕێ، دوو هێلکـە دەکـەن، سێ جۆریان هەیە: چرگ؛ چووکە چرگ؛ زڕهگ؛ چووکە چرگ؛ زڕەچرگ ≌ هوبره؛ میش‌مرغ

**چرم** / çirm/: ☜ **چلم ـ۱**

**چرمس** / çirmis/: ئاوەڵناو. سیس؛ چرمس؛ ژاکاو ≌ پژمُرده

**چرمسان** / çirm(i)san/: ☜ **چرمسین**

**چرمســاندن** / çirm(i)sandin/: چـاوگ. چرمساندنەوە؛ چلمساندن؛ نەرم و شل کـردن ≌ پژمُرده کردن

**چرمســاندنەوە** / çirm(i)sandinewe/: ☜ **چرمساندن**

**چرمســانەوە** / çirm(i)sanewe/: چـاوگ. چرووسـانەوە؛ پـووچ بوونـەوە لـە بـەر لاوازی ≌ پژمُردن

**چرمسی** / çirm(i)sî/: ئاوەڵـناو. سـیس؛ ژاکـاو ≌ پژمُرده

**چرمسین** / çirm(i)sîn/: چاوگ. چرمسـان؛ ژاکـان؛ سیس بوون ≌ پژمُردن

**چرمسیو** / çirm(i)sîw/: ئاوەڵـناو. گـرژ؛ ژاکـاو؛ دژداماو؛ کز ≌ افسُرده

**چرمقی** / çirm(i)qî/: ئاوەڵناو. قرچاو؛ هەڵقرچاو ≌ ترنجیده

**چـرمقین** / çirm(i)qîn/: چـاوگ. هەڵـقرچان؛ ترنجیانە یەک ≌ ترنجیدن

**چرمن** / çirmin/: ☜ **چلمن**

**چرنگ** / çiring/: دەنگەناو. جرنگە؛ زرنگـە؛ دەنگـی لێک کەوتنی کانزا، بەتایبەت زێڕ و زیو ≌ جرینگ

**چرنگین** / çiringîn/: چاوگ. زەنگ لێدان ≚ زنگ زدن

**چرنووق** / çirnûq/: ☜ **چرنووک**

**چرسکە** / ç(i)ruske/: ☜ **چرووسکە**

**چروە** / çirwe/: ناو. ئەسپ ≚ اسب

**چرۆ** / ç(i)ro/: ناو. چرەوە: ١. لکی باریکی دار ٢. خونچەی تازەی گەڵادار ≚ ١. جوانەی درخت ٢. شکوفەی برگ

**چرۆکۆ** / ç(i)roko/: ناو. بێشە؛ لێڕەوار ≚ بیشەزار

**چرۆنەک** / ç(i)ronek/: ئاوەڵناو. حەشاردراو؛ نادیار ≚ پنهان

**چرووس** / ç(i)rûs/: ناو. بریقە؛ برووسکە ≚ درخشش

**چرووسان** / ç(i)rûsan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //چرووسای؛ دەچرووسێی؛ بچرووسێ// ١. درەوشینەوە؛ ورشە دان ٢. چەوسانەوە؛ زڵم و زۆر کێشان ٣. *[مەجاز]* لاواز بوون لە خەم و خەفەتان ≚ ١. درخشیدن ٢. ستم کشیدن ٣. لاغر شدن از شدت غم و غصه

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: چرووساو/ چاوگی نەرێنی: نەچرووسان

**چرووساندن** / ç(i)rûsandin/: چاوگ. تێپەڕ. //چرووساندن؛ دەچرووسێنی؛ بچرووسێنە// چەوساندنەوە؛ ئازار دان ≚ آزار دادن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ــــ/ چاوگی نەرێنی: نەچرووساندن

**چرووساندنەوە** / ç(i)rûsand(i)newe/: چاوگ. ١. چەوساندنەوە؛ ئازار دان ٢. ☜ **چرووکاندن** ≚ ١. آزار دادن ٢. ☜ **چرووکاندن**

**چرووسانن** / ç(i)rûsanin/: چاوگ. سیساندن؛ پەژمەراندن ≚ پژمُرده کردن

**چرووسانەوە** / ç(i)rûsanewe/: چاوگ. تێنەپەڕ. //چرووسایەوە؛ دەچرووسێیەوە؛ بچرووسێوە// چەوسانەوە؛ ڕەنج دیتنی زۆر؛ ئازاری زۆر کێشان ≚ رنج بسیار کشیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: چرووساوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەچرووسانەوە

**چرووساوە** / ç(i)rûsawe/: ئاوەڵناو. ١. لاواز لە بەر ڕەنج دیتنی زۆر ٢. ڕووت و قووت (دار و گیا) ≚ ١. لاغر از رنج دیدن زیاد ٢. برگ و بَر ریخته

**چرووسکەڕاو** / ç(i)rûskeřaw/: ناو. شەوڕاوی پەلەوەر (کەو) بە تیشکی چرا و ئاگر ≚ شکار پرنده با چراغ

**چرووسکە** / ç(i)rûske/: ناو. ترووسکە؛ چروسکە؛ ورشە ‹گافا فە ددەت وەکی برووسکە/ بێ‌شوعلە و پێت و بێ چرووسکە «خانی»› ≚ درخشش

**چرووک** / ç(i)rûk/: ئاوەڵناو. ١. قەڵب؛ بێ‌نرخ ‹نەقدی دڵی کە ڕائیجی سەودایی تۆ نەبێ/ مەغشووش و کەم عەیارە و هەم قەلب و هەم چرووک «نالی»› ٢. چکووس؛ ڕژد؛ دەس‌قووچاو ‹واتا: نە ڕژد و چرووک بە لۆمەت بکەن، نە ئەوەندە دەسبلاو بە بتخاتە سەرساجی عەلی و چیت نەمێنێ «هەژار، *چوار نامیلکە*»› ≚ ١. جعلی و بی‌ارزش ٢. خسیس

**چرووکان** / ç(i)rûkan/: چاوگ. چرووکانن؛ سیرەسیڕ کردن؛ چیرەچیڕ کردن ≚ جیر- جیر کردن

**چرووکاندن** / ç(i)rûkandin/: چاوگ. چرووساندن؛ چرووساندنەوە؛ چەوساندنەوە ≚ بسیار آزار دادن

**چرووکانن** / ç(i)rûkanin/: ☜ **چرووکان**

**چرووکە** / ç(i)rûke/: دەنگەناو. دەنگی چرووکان ≚ جیر - جیر

**چرووکی** / ç(i)rûkî/: ناو. پیسکەیی؛ ڕژدی ≚ خِسّت

**چروونەک** / ç(i)rûnek/: ناو. لووساوک؛ لووس؛ پلووسک ≚ ناودان

**چرەنن** / ç(i)renin/: چاوگ. لەوەڕاندن ≚ چراندن

**چرەوە** / ç(i)rewe/: ☜ **چرۆ**

**چری** / ç(i)rî/: ناو. تەشرین؛ تشرین؛ ناوی دوو مانگ لە مانگی ڕۆمی ≚ نام دو ماه از ماه‌های رومی

⊡ **چریا نیکن**: تشرینی یەکەم؛ لە دەی ڕەزبەرەوەیە تا دەی خەزەڵوەر ☰ أُکتبر

**چریا دوا**: تشرینی دووهەم؛ لە دەی خەزەڵوەرەوە تا دەی سەرماوەز ☰ نوامبر

**چریسک** / ç(i)rîsk/: ناو. چلۆسک؛ بزووت؛ سەرەبزووت ☰ نیمسوز

**چریسکان** / ç(i)rîskan/: چاوگ. بریقانەوە ☰ درخشیدن

**چریسکە** / ç(i)rîske/: ناو. تروووسکەی کەم ☰ سو سو

**چریسکین** / ç(i)rîskîn/: چاوگ. چلقلین؛ برووسکە دانەوە ☰ درخشیدن

**چریش** / ç(i)rîş/: ناو. چریش؛ ئەسریلک؛ سریش ☰ سریشُم

**چریکاندن** / ç(i)rîkandin/: چاوگ. تێنەپەڕ. //چریکاندت؛ دەچریکێنی؛ بچریکێنە// چریکە کردن ☰ چهچهه زدن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەچریکاندن

**چریکنای** / ç(i)rîknay/: چاوگ. چریکاندن؛ چریکە کردن ☰ چهچهه زدن

**چریکە** / ç(i)rîke/: ناو. ١. چیکەنە؛ ئامرازی پەنبۆ لە دەنک جوێ کردنەوە ٢. دەنگی زۆر تیژی خۆش ٣. ژانی پەیتا ـ پەیتای لەش ‹تاوناتاوێ چریکەیەک لە پشتمەوە هەڵدەستێ› ☰ ١. دستگاه پنبه پاک‌کنی ٢. صدای رسای گوشنواز ٣. چگونگی تیر کشیدن اندام

**چرێش** / ç(i)rêş/: ☜ **چریش**

**چڕ**[١] / çiř/: ناو. ١. قاو؛ بانگ ٢. شەتەک؛ کاری توند بەستن ٣. گۆرانی؛ لاوک ‹چڕێ بچڕە› ☰ ١. بانگ؛ عمل صدا زدن ٢. عمل مُحکم بستن ٣. ترانه

⊡ **چڕ دان**: شەتەک دان؛ سفت و توند بەستن ‹چڕی دە! با نەکرێتەوە› ☰ محکم بستن

**چڕ**[٢]: ئاوەڵناو. ١. چیر؛ جیڕ؛ تایبەتمەندی ماکی (وەک نان) لە جاویندا دژوار ‹نانەکە چڕە، ناجاوگێ› ٢. پڕ ‹نە ورشەی گیای مێرگی سەوزی دەمەو بەهارم/ نە شنەی بای دارستانی چڕی نزارم «گۆران»› ٣. لە کێشاندا خۆگر و نەپس ‹هێندە چڕە، وەک جیل وایە› ٤. زۆر لێژ ‹هەورازێکی چڕە؛ شاخێکی چڕە› ٥. ماق؛ زاق؛ زەق ‹پێم مەڵێ کە ئالی زالی شەو، چاوی بێخەوی چڕە «سوارە»› ☰ ١. بیات (نان) ٢. انبوه ٣. کشدار ٤. سخت؛ شیبدار ٥. خیره

**چڕ**[٣]: دەنگ. دەنگی دڕانی تەنراوە ☰ صدای پاره شدن پارچه

**چڕ •**[٤]: پێشەوشە. [مەجاز] سەخت؛ پارێز؛ بە دەستەوە نەدەر ‹چڕدەرپێ› ☰ سخت

**• چڕ**[٥]: پاشەوشە. ـ وێژ ‹لاوژەچڕ› ☰ ـ سرا

**چڕ**[٦]: لێل. ← **چڕوچاو/ چڕوچیلکە**

**چڕا**[١] / ç(i)řa/: ئاوەڵناو. فێرەلەوەڕ ☰ چریدن آموخته

⊡ **چڕا بوون**: فێرە لەوەڕ بوون ‹بەرخەکانمان چڕا بووگن› ☰ چریدن آموختن

**چڕا**[٢]: ئاوەڵکار. بۆ؛ بۆچی؛ ئەڕا؛ لە بەر چی ☰ چرا

**چڕان** / ç(i)řan/: چاوگ. پچڕان؛ بچڕیان؛ قرتان؛ لێک‌بوونەوە ☰ گُسستن

**چڕاندن** / ç(i)řandin/: چاوگ. ١. لەت کردن؛ دڕاندن؛ دادڕین ٢. بانگ کردن؛ گازی کرن ٣. دەنگ هەڵێنان لە قام گوتنا ٤. لەوەڕاندن ☰ ١. جِر دادن ٢. صدا زدن ٣. در اوج خواندن ٤. چرانیدن

**چڕاو** / ç(i)řaw/: ئاوەڵناو. ١. پڕ و تێکەڵاو ٢. پچڕاو؛ قرتیاگ ‹پەتی چڕاو› ☰ ١. در هم رفته ٢. قطع شده

**چڕای** / ç(i)řay/: چاوگ. قاو کردن؛ دەنگ دان ☰ صدا زدن

**چڕتەی** / çiřtey/: چاوگ. دەنگ دان؛ بانگ کردن ☰ صدا زدن

**چـڕدۆ** / çiřdo/: ئاوەڵـناو. جـــڕدۆ؛ تایبەتمەنـــدی ئاژەڵێ کە کاتی دۆشین گوانی تونـد دەکـا و بـە باشی شیرەکەی نادا ■ ویژگی دامی کە بـە خـوبی شیر نمی‌دهد

**چڕدەرپێ** / çiřderpê/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* تایبەتمەندی ژنێ کە درەنگ و بە سەختی خـۆ بـە دەسـتەوە دەدا ■ ویژگی زنی کە بە سختی تمکین کند

**چڕژان** / çiřjan/: چاوگ. تێکهـاڵان ■ تـوی هـم رفتن

**چڕک** / çiřk/: ناو. ۱. هەتوان؛ مەرهەم ۲. دۆشاوی خەسـتی دوو جـار کـولاو ۳. چێشـتی خورمـا و پەنیری سوورەوەکراو ٤. چیکەنە؛ ئـامرازی پـەمۆ خـاوێن کردنـەوە ٥. جـۆرێ نـان ■ ۱. مـرهم ۲. شیرەی دوآتشه ۳. خوراک خرما و پنیر سـرخ شـده ۴. ابزار حلاجی ۵. نوعی نان

**چڕکین** / çiřkîn/: ☜ **چلکن**

**چڕگاو** / çiřgaw/: نـاو. زەلکاوی پڕ و چـڕ ■ نیـزار انبوه

**چڕگـە** / çiřge/: نـاو. جێگـــای دژوار و چـــڕ ■ سنگلاخی

**چڕگەر** / çiřger/: ناو. گۆرانی‌بێژ ■ آوازخوان

**چڕگەن** / çiřgen/: ناو. شوێنی پڕ گژ و گیا کـە بـە زەحمەت بکێڵرێ ■ علفزار انبوه کە شـخم‌زدنـش دشوار است

**چڕنوسقاو** / çiřnûsqaw/: نـاو. تۆزە چەوراییی سەر ئاوی کولاو ■ اندک چربی روی آب جوشیده

**چڕنوک** / çiřnûk/: ناو. چرنووق؛ چنگ؛ چنگورک؛ نینۆکی تیژی پشیلە و دڕنـدە ■ چنگـال (گربـە و جانوران درنده)

⊡ **چڕنوک گرتن**: ڕنین ■ چنگ زدن

**چڕنەمـووره** / çiřnemûre/: نـــاو. *[بـاوەڕی کـــۆن]* دێوێکی ئەفسانەیە، دەڵێن هـەزار جـار بیکـوژی لەگەڵـکوو دڵـۆپی خـوێنی بڕژێتـە سـەر عـەرز، زیندوو دەبێتەوە ■ دیوی در افسانەها

**چڕنەوپڕنـــە** / çiřnewpiřne/: ئاوەڵـــناو. *[بـــلار]* شڕنەوپڕنە؛ هەرچی و پەرچی؛ سووک و بێ‌بایـەخ ‹چڕنەوپڕنەی تێ‌ڕژابوو› ■ لات و لوت

**چڕوچاو** / çiř û çaw/: ناو. تەرح و دیـدار ■ سـر و سیما

**چڕوچەنە** / çiř û çene/: ناو. تەرح و دیدار ■ سر و سیما

**چڕوچیلکە** / çiř û çîlke/: نـاو. دارووکـە و پـڕ و پووش بۆ ئاگر ■ افروزنە

**چڕوچێو** / çiř û çêw/: ناو. چیلکـە و چـەوێڵ ■ خُردە چوب خشک

**چڕوو** / ç(i)řû/: ☜ **چلۆ-۱**

**چڕە**[۱] / ç(i)ře/: نـاو. ۱. گۆرانی ۲. گازی؛ بانگ؛ قاو ۳. *[مەجاز]* قەرەباڵغی؛ ئاپۆرەی خەڵـک ■ ۱. آواز ۲. بانگ ۳. ازدحام

**چڕە**[۲]**-**: پێشوشە. پڕ و خەست ‹چڕەدووکەڵ› ■ انبوه

**چڕەبەنـــدان** / ç(i)řebendan/: نـــاو. پـــــڕایی و تێکەڵ-پێکەڵی خەڵک ■ شلوغی و ازدحام

**چڕەچەمان** / ç(i)řeçeman/: نـاو. ۱. چڕەدووکـەڵ؛ دووکەڵی زۆر و خەست ۲. گێژەڵووکە ۳. کـرێوە ■ ۱. دود غلیظ ۲. گردباد ۳. کولاک

**چڕەدووکـەڵ** / ç(i)ředûkeł/: نـاو. چەڕەدووکـــەڵ؛ چەقەدووکەڵ؛ کادووی زەحـف؛ دووکەڵـی زۆر و سەخت ■ دود غلیظ

**چڕەکەو** / ç(i)řekew/: ناو. کێبـەرکێی خوێنـدنی دوو یا چەند کەو ■ مسابقەی کبک‌خوانی

**چڕی** / ç(i)řî/: ناو. پڕی ■ انبوهی

**چـڕین** / ç(i)řîn/: چـاوگ. ۱. گـــوتن؛ گـــۆرانی خوێندن ۲. پچڕین؛ پساندن؛ قرتانـدن ‹زنجـیری زوڵمی زۆرداریی ئەچڕن/ دەوڵەت بە دەوڵـەت، شـار بە شار ئەفڕن «قانع»› ۳. بانـگ کـردن ‹یـە چـڕی ئاغـا! ئـەو داد کـەی سـەرکارا/ دەسمایـە نـەیریم،

حەساوەکەت بار «شامی»» 🇮🇷 ۱. آواز خواندن ۲. گُسستن ۳. صدا زدن

**چڕینەوە / ç(i)řînewe/**: چاوگ. هۆرە کردن 🇮🇷 تحریر دادن

**چڕیەی / ç(i)řyey/**: چاوگ. دەنگ دان 🇮🇷 صدا زدن

**چڕێک / ç(i)řêk/**: ناو. قرقرە؛ غەرغەرە؛ مەکارە 🇮🇷 قرقره

**چز[1] / çiz/**: ناو. ۱. دوایی؛ کلکە ۲. چزوو؛ چزە؛ چووزە؛ قەگەز؛ ئەستنگ؛ بەشێک لە ئەندامی گیاندارانی چزدار (وەک مار، دووپشک، زەرگەتە و ...) کە ژاری پێ دەڕێژن ۳. ئاسەواری پێوەنووسانی گڕ و تاوی پێست سووتێن ٤. کاری کوژاندنەوە؛ خەت کێشانی نووسراو 🇮🇷 ۱. دُنباله ۲. نیش ۳. داغ ۴. عمل خط کشیدن نوشته

▣ **چز پێدان** درێژە دانی مەبەست؛ لە سەر باس ڕۆیشتن 🇮🇷 دنباله‌ی سُخن را گرفتن

**چز پێوە دان** ۱. پێوەدان؛ چز لێدان؛ چزوو تێڕۆ چوون/ کردن ۲. ☜ **چز وەشاندن** 🇮🇷 ۱. نیش زدن ۲. ☜ **چز وەشاندن**

**چز کردن** خەت بە سەردا کێشان و کوژاندنەوە 🇮🇷 خط کشیدن نوشته

**چز وەشاندن** *[کینایە]* چز پێوە دان؛ تانە لێدان 🇮🇷 طعنه زدن

**چز[2]**: دەنگ. دەنگی ڕۆنی داغ لە هەڵچۆقاندا 🇮🇷 صدای روغن داغ

**چزان / ç(i)zan/**: چاوگ. تێنەپەر. //چزای؛ دەچزێی؛ بچزێ// ۱. پێوەنووسان یان لێ‌کەوتنی شتی داخ ۲. پێوەدران و گەزران 🇮🇷 ۱. داغ شدن ۲. نیش خوردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: چزاو/ چاوگی نەرێنی: نەچزان

**چزاندن / ç(i)zandin/**: چاوگ. تێپەر. //چزاندت؛ دەچزێنی؛ بچزێنە// چزانن: ۱. داغ پێوەنان ۲. پێوەدانی زەرگەتە و دووپشک ۳. چۆقاندنی ڕۆن 🇮🇷 ۱. داغ کردن ۲. نیش زدن عقرب و زنبور ۳. جوشاندن روغن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ــ/ چاوگی نەرێنی: نەچزاندن

**چزانن / ç(i)zanin/**: ☜ **چزاندن**

**چز ـ چز / çiz çiz/**: دەنگەناو. دەنگی وێک‌کەوتنی سوورەوەکراو دەگەڵ ئاودا 🇮🇷 صدای تماس آب با جسم تفته

**چزدار / çizdar/**: ئاوەڵناو. ۱. ☜ **چزوودار** ۲. *[مەجاز]* ئازاردەر؛ وێڕای تەوس و توانج (قسەی چزدار) 🇮🇷 ۱. ☜ **چزوودار** ۲. نیشدار

**چزران / çizran/**: چاوگ. تێنەپەر. نادیار. //چزرای؛ دەچزرێی؛ بچزرێ// چزیان 🇮🇷 داغ شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: چزراو/ چاوگی نەرێنی: نەچزران

**چزرین / çizrîn/**: چاوگ. ۱. سیسیان؛ ژاکان ۲. چرچ بوون 🇮🇷 ۱. پژمُرده شدن ۲. چروکیدن

**چززە / çizze/**: ☜ **چزە**

**چزلک / çizlik/**: ناو. ساتوور؛ ساتۆر 🇮🇷 ساطور

**چزلیک / çizlîk/**: ناو. جۆرێ کێردی کەوانی وەک خنجێر 🇮🇷 گزلیک

**چزڵیک / çizłîk/**: ناو. چزیلک؛ چزیلە؛ چزڵێک؛ ژزیلک؛ چلەوەزی؛ دووگی سوورەوەکراو 🇮🇷 جزغاله

**چزڵێک / çizłêk/**: ☜ **چزڵیک**

**چزمە / çizme/**: ناو. جزمە؛ کەوشی ملدرێژ تا زرانی 🇮🇷 پوتین بلند

**چزنای / çiznay/**: چاوگ. چزاندن 🇮🇷 نیش زدن

**چزوبز / çiz û biz/**: دەنگەناو. جزوبز؛ قژە؛ جز؛ کزوبز 🇮🇷 جزولز

**چزوهۆڕ / çiz û hoř/**: دەنگەناو. دەنگی سوورەوە کردن و هەڵچۆقاندنی ڕۆن 🇮🇷 جز و وز

**چزو** / ç(i)zû/: ☜ **چز¹ـ٢**

**چزودار** / ç(i)zûdar/: ئاوەڵناو. چزدار؛ خاوەن چزوو ‹کوڕ وەک گوڵی گوڵزارە، ئەمما سەمەری خارە/ وەک هەنگی چزوودارە، هەنگوینی موسەففا کچ «نالی»› ≡ نیشدار

**چزونە** / ç(i)zûne/: چاوگ. پێوەدانی دووپشک و ... ≡ نیش زدن

**چزە¹** / ç(i)ze/: ناو. [منداڵانە] چززە؛ گۆشتی برژاو ≡ گوشت بریان

**چزە²**: دەنگەناو. چززە: ١. دەنگی برژانی گۆشت ٢. دەنگی هەڵچۆقانی ڕۆن ≡ ١. صدای بریان شدن گوشت ٢. صدای روغن داغ شده

◻ **چزە لێدان:** [کنایە] بەڵا پێ گەیاندن ≡ بلا بر سر کسی آوردن

**چزە لێهەستان/ لێهەڵسان** ١. داخ کردن ٢. هەست بە داغ کردن ≡ ١. داغ کردن ٢. احساس تماس با جسم داغ کردن

**چزە لێهەڵساندن:** داغ کردن؛ شتی سوورەوەبوو پێوەنان ≡ داغ کردن

**چزە لێهێنان** ١. (چز) پێوەدان ٢. هەستی داغ کردن ≡ ١. نیش زدن ٢. احساس سوختن کردن

**چزەپێڵە** / ç(i)zepêłe/: ناو. جۆرێ دووپشک ≡ نوعی عقرب

**چزەچز** / ç(i)zeçiz/: دەنگەناو. چزەی زۆر ≡ جز و وز

**چزیاگ** / çizyag/: ئاوەڵناو. گەستە؛ پێوەدراو ≡ گزیده

**چزیان** / çizyan/: چاوگ. ١. چزوو تێراچوون ٢. برژان لە سەر ئاگر ≡ ١. نیش خوردن ٢. بریان شدن

**چزیای** / çizyay/: چاوگ. چزران؛ لێکەوتنی شتی داغ ≡ داغ شدن

**چزیر** / ç(i)zîr/: ناو. دوڕگە؛ گراوە؛ درگە ≡ جزیره

**چزیرگە** / ç(i)zîrge/: ناو. ڕەند؛ گراڤ ≡ جزیرەی کوچک

**چزیلک** / ç(i)zîl(i)k/: ☜ **چزڵیك**

**چزیلە** / ç(i)zîle/: ☜ **چزڵیك**

**چزیمزی** / ç(i)zîm(i)zî/: ناو. زێ ـ زێ؛ زمانی زێرنگەران ≡ زبان زرگری

**چست** / çist/: ناو. چێژە؛ چێژ؛ چەژە ≡ مزه

**چسک** / çisk/: ئاوەڵناو. چوست و چالاک ≡ چُست و چالاک

**چش¹** / çiş/: ئاوەڵناو. هیچ؛ هیچ شت؛ نە تشت ‹چیت هەیە؟ چش!› ≡ هیچ

**چش²**: جێناو. ١. ئەوەی؛ ئەوی ‹چش لەوێ بوو پیاو بوون!› ٢. چ؛ چی؛ هیچ شت ‹چشم بوو بیدەم؟› ≡ ١. آنچه؛ هرآنچه ٢. چه؛ هیچ چیز

**چش³**: شبەجملە. ١. بە توون؛ بە دەرەک ‹ئەوان بە بۆمبا بمانکوژن چش/ وەحشین بە مێشیان ئێمە بلەین کش! «هەژار، بۆ کوردستان»› ٢. گرنگ نییە ‹ناڵێم مەخۆن، چش لە خواردن/ چش لە ورگیش پەتی کردن! «گۆران»› ≡ ١. به درک ٢. مهم نیست

◻ **چش لێکردن:** بە توون لێ کردن ‹کەسی واشمان نەبووە چش لە بەرماوی بێگانە بکا و هەڵپەرستی بە گەلپەرستی بگۆڕێتەوە و دەنگ هەڵێنێ و لەو خەوە بێبرانەوەیەمان ڕاپەڕێنێ و تۆزێکمان لە دەردی خۆمان تێبگەیەنێ «هەژار، شەرەفنامە»› ≡ صرفنظر کردن

**چشت** / çişt/: ناو. تشت؛ شت؛ ناها ≡ چیز

**چشتمشت** / çiştmişt/: ناو. [کنایە] خۆراکی؛ خواردەمەنی ≡ خوراکی

**چشە** / ç(i)şe/: دەنگ. وشەی لێخوڕینی کەر ≡ صوت راندن الاغ

**چغ¹** / çiğ/: ناو. بسکی هەڵگەڕاوە ≡ سرِ زلف

**چغ²**: دەنگ. چخە؛ چخ؛ چغە؛ وشەی سەگ ڕاونان ≡ چخه

**چغا** / ç(i)ğa/: ناو. تەپۆڵکە؛ تەپە؛ گرد؛ گر ▤ تپه

**چغاندن** / ç(i)ğandin/: چاوگ. چغە کردن ▤ چخ کردن

**چغچغە** / çiğç(i)ğe/: ناو. شەقشەقە ▤ جغجغه

**چغر** / çiğir/: ناوەڵناو. ١. چڕ؛ چغور؛ چوغور؛ چوغورد؛ پڕ ٢. ☜ **چقر** ▤ ١. انبوه ٢. ☜ **چقر**

**چغراندن** / çiğrandin/: چاوگ. هـان دان؛ هەڵخڕاندن ▤ تحریک کردن

**چغور** / ç(i)ğur/: ☜ **چغر**

**چغۆ** / ç(i)ğo/: ☜ **چەقۆ**

**چغە**[1] / ç(i)ğe/: دەنگ. دەنگی سەگ ڕاو نان ▤ چخه

**چغە**[2]: دەنگەناو. وشەی ڕاو نانی سەگ ▤ چخه

⊡ **چغە لێکردن:** دەرکردنی سەگ ▤ راندن سگ

**چف**[1] / çif/: ناو. چەماوی ▤ خمیدگی

⊡ **چف کرن:** فێڵ کردن ▤ حیله کردن

**چف**[2]: دەنگەناو. چپە؛ سرتە؛ سرکە؛ پچەپچ ▤ پچ - پچ

**چفان** / ç(i)fan/: چاوگ. ١. چەمینەوە؛ کۆمەو بوون ٢. دەرکران ٣. سەرکۆنە کردن ▤ ١. خم شدن ٢. رانده شدن ٣. سرزنش کردن

**چفاندن** / ç(i)fandin/: چاوگ. ١. چەماندنەوە؛ کۆمەو کردن ٢. دەرکردن ٣. سەرکۆنە کردن ▤ ١. خم کردن ٢. راندن ٣. سرزنش کردن

**چفانێ** / ç(i)fanê/: ناو. سرتە؛ سرکە؛ پچەپچ؛ چپە ▤ پچ-پچ

**چفت** / çift/: ناو. قفل؛ قوفل؛ قوڵف ▤ قُفل

**چفتە**[1] / çifte/: ناو. تفەنگی ڕاو ▤ تفنگ شکاری

**چفتە**[2]: ناوەڵناو. سیابەخت؛ بەدبەخت ▤ بدبخت

**چفتەلێس** / çiftelês/: ناوەڵناو. چڵێس؛ سکن ▤ شکمو

**چفنای** / çifnay/: چاوگ. چپە کردن؛ چپاندن ▤ پچ - پچ کردن

**چفە** / ç(i)fe/: دەنگەناو. چپە؛ سرتە ‹چفەی بێ وادەی نیازان نازان/ بندەسی دا دەنگ بازان یا نازان «مەولەوی»› ▤ پچ - پچ

**چفەچف** / ç(i)feçif/: دەنگەناو. پچەپچ؛ سرتەسرت ▤ پچ - پچ

**چفیای**[1] / çifyay/: چاوگ. بوونە چپە و بە گوێ دران ▤ به گوش رسیدن (از طریق پچ - پچ)

**چفیای**[2]: ناوەڵناو. ١. چەماوە ٢. دەرکراو ▤ ١. خم‌شده ٢. بیرون رانده‌شده

**چڤاتگە** / ç(i)vatge/: ☜ **جڤاتگە**

**چڤاندن** / ç(i)vandin/: ☜ **چەماندن ـ١**

**چڤر** / çivr/: ناوەڵناو. لیچق؛ لیق؛ لینج ▤ لزج

**چڤۆ** / ç(i)vo/: ناوەڵناو. فێڵەباز ▤ مکّار

**چڤی** / ç(i)vî/: ناوەڵناو. چەماو؛ چەمیو؛ خوارەوەبوو؛ داهاتوو؛ چڤیای ▤ خمیده؛ کوژ

**چڤیای** / çivyay/: ☜ **چڤی**

**چڤیت** / ç(i)vît/: ☜ **چوویت**[2]

**چڤیک** / çivîk/: ناو. چڤینک؛ چیڤک؛ مەلیچک؛ پاساری؛ چۆلەکە ▤ گنجشک

**چڤین** / çivîn/: چاوگ. ١. چەمین ٢. فیتوو لێدان ▤ ١. خمیدن ٢. سوت کشیدن

**چڤینک** / ç(i)vînik/: ☜ **چڤیک**

**چڤینگ** / ç(i)vîng/: ☜ **چۆلەکە**

**چق**[1] / çiq/: ناو. ١. لکی پچووکی ڕاستدەرچوو لە دار ٢. چقە؛ چۆ؛ چۆب؛ قیتکەی پاژنەی کەڵەشێر ٣. وردەڕەگی ناو گۆشت ▤ ١. جوانه‌ی برآمده از تنه ٢. برآمدگی پاشنه‌ی خروس ٣. رگ و پی گوشت

**چق**[2]: ناوەڵناو. چەق؛ چەقاڵتە ▤ نامرغوب (گوشت)

**چقا** / ç(i)qa/: ☜ **چقاس**

**چقاس** / ç(i)qas/: ناوەڵناو. چقا؛ چ ئەندازە؛ چەند ▤ چقدر

**چقچقاندن** / çiqç(i)qandin/: چاوگ. قرچاندنەوە

≡ چروک کردن

**چقر** / çiqr/: ناو. چغر؛ خاچ؛ خالی خاچ له پەڕی پاسووردا ≡ خاج ورق

**چقڵ** / çiq(i)ł/: ناو. چقـوڵ؛ دڕک؛ دڕوو؛ دڕی ≡ خار

◙ **چقڵە کەوە:** پـوور ئایشـێ؛ جـۆری دڕووی کورتەبالا ≡ نوعی خار

**چقڵە کەوێ:** دڕووە زەردە ≡ نوعی خار

**چقڵی مەموزینان:** *[کینایە]* شۆفار و شـەیتانی دژی دوو دۆست ≡ دشمن دلدادگان

▣ **چقڵی چاوی کەسێک بوون:** *[مەجاز]* بوونە هۆی ڕق و زیزی کەسێ ≡ خار در چشم کسی بودن

**چقڵاوی** / çiqławî/: ئاوەڵناو. دڕکـاوی؛ دڕکـدار ≡ خاردار

**چقوڵ** / ç(i)quł/: ☜ **چقڵ**

**چقە** / ç(i)qe/: ☜ **چق[1]ـ۲**

**چقیر** / ç(i)qîr/: ناو. چەکەرە ≡ جوانە

**چقیر** / ç(i)qîr/: ناو. نینۆک؛ نەنووک؛ نـەینۆک ≡ ناخن

**چک[1]** / çik/: ناو. ۱. قوێرەی میچ؛ جگـی لـە سـەر پشت‌کەوتوو ۲. کۆتایی؛ دوایی ۳. چەکەرە ≡ ۱. طرف پُشت قاپ بازی ۲. قطع ۳. جوانە

**چک[2]**: دەنگەناو. دەنگی دڵۆپە ئاو ≡ صدای چکیـدن آب

• **چک[3]**: پاشەوشە. ـ ێنە: ۱. لە ئاوەڵناو، ناو دروست دەکـا ‹سـپیچک› ۲. لـە نـاو، نـاوێکی گچکـەتر دروست دەکا ‹کابچک؛ کونچک› ۳. ـ جق؛ لیچق ‹شیرنچک› ≡ ۱تا۳. ـ ک

**چکارە** / ç(i)kare/: ئاوەڵناو. چەکارە: ۱. پرسیار لـە پیشەی کەسێ ‹بابت چکـارەیـە› ۲. پرسـیارێکی نەرێنی واتا بە تۆ چی ‹ئەرێ تـۆ چکـارەی فـەرمان دەدەی؟› ≡ ۱و۲. چکاره

**چکاڵ** / ç(i)kal/: ناو. پرووپووش ≡ خس‌وخاشاک

**چکان** / ç(i)kan/: چاوگ. تێنەپەر. //چکای؛ دەچکێ؛ بچکێ// چکیان: ۱. تکـان؛ تکیـان ۲. داچـەکانی کانی و بیر؛ وشک بوونی تەوش ‹چکاوە ئاوی پـرژ و گۆلەشینی/ نەماوە هەر لە کۆتر تا شەهێنی «حاجی قادر»› ≡ ۱. چکیدن ۲. خشکیدن آب چاه و چشمه

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: چکـاو/ چـاوگی نـەرێنی: نەچکان

**چکاندن** / ç(i)kandin/: چـاوگ. تێـەپ. //چکانـدت؛ دەچکێنی؛ بچکێنە// چکاندنەوە: ۱. وشک کردنی تراو ۲. چەقاندنی شەتڵ ۳. تکانـدن؛ بـە دڵـۆپە داکردنی ئاو ≡ ۱. خشکانیدن مایع ۲. کاشتن نهـال ۳. چکانیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەچکاندن

**چکاندنەوە** / ç(i)kandinewe/: ☜ **چکاندن**

**چکانن** / ç(i)kanin/: چاوگ. تکاندن؛ چکانـدن ≡ چکانیدن

**چکانەوە** / ç(i)kanewe/: چاوگ. تێنەپەر. //چکایەوە؛ دەچکێیەوە؛ بچکێوە// ۱. کوڵاندنی تراو تا خەست بوونی ۲. چۆڕانەوە؛ داچۆڕیان؛ ئاو تێدا نـەمان ≡ ۱. جوشاندن و غلیظ کردن مایع ۲. خشکیدن

■ ئاوەڵناوی بـەرکاری: چکـاوەوە/ چـاوگی نـەرێنی: نەچکانەوە

**چکای** / ç(i)kay/: چاوگ. چکان؛ تکان؛ تکیـان ≡ چکیدن

**چکایرە** / ç(i)kayre/: چاوگ. تکین؛ تکیان؛ چکان ≡ چکیدن

**چکچکانـدن** / çikç(i)kandin/: چـاوگ. قـۆڵ لێ‌هەڵکردن بۆ شەڕ یـا خـۆ چەکـدار کـردن ≡ مهیای نبرد شدن

**چکچکە** / çikç(i)ke/: ناو. ۱. دڵۆپە و ئـاوەچۆڕەی دایمە لە درزی شاخ و ئەشـکەوتانەوە ‹تـۆ ئێسـتا چکچکـەی دەراڵـی زمـانی و/ لـە شـەوی غوربـەتا دائەدەیت «شـێرکۆ»› ۲. پندریسـک؛ غندەگوڵـە؛

بالندەیەکی چکۆڵە و بۆر و تیژڕۆیە، لە نێو دڕک و دالاندا دەژی 🇮🇷 ۱. چکّه ـ چکّه ۲. پرندەای است

**چکر** / çikr/: ناو. نینۆک؛ ناخوون؛ ناخوێن؛ نانووخ 🇮🇷 ناخن

**چکرگر** / çikirgir/: ناو. نینۆکبڕ؛ نەنووکگر؛ ناخونگر 🇮🇷 ناخُنگیر

**چکرم** / çikirm/: ناو. داری سەر دە عەرز چەقێندراو 🇮🇷 چوب یک سر در زمین فرو شده

**چکرە** / çikre/: ناو. منالّ؛ مندالّ 🇮🇷 کودک

**چکلان** / çiklan/: چاوگ. چەقان؛ چەقیان 🇮🇷 نشانده شدن

**چکلاندن** / çiklandin/: چاوگ. چەقاندن 🇮🇷 نشاندن

**چکلیت** / çiklît/: ناو. شوکلات؛ شوکولات؛ چاکلێت؛ جۆرێک شیرینی لە کاکائوو و شەکر 🇮🇷 شُکلات

**چکڵ** / çik(i)ł/: ناو. چقڵ؛ دڕک 🇮🇷 خار

**چکڵە** / çikłe/: ☜ **چوکڵە**

**چکڵەچزێ** / çikłeç(i)zê/: ☜ **چوکڵەچزێ**

**چکمەساو** / çikmesaw/: ناو. باقە گیای نەبەسراوی گەورە 🇮🇷 تودەی انباشتەی گیاه

**چکنای** / çiknay/: چاوگ. چکاندن؛ تکاندن 🇮🇷 چکاندن

**چکنەر** / çikner/: ☜ **چەوەندەر**

**چکوچک** / ç(i)kuçik/: ناو. دارەسمە؛ دارتەقێنە 🇮🇷 دارکوب

**چکولوکە** / ç(i)kulûke/: ئاوەڵناو. قچک؛ بچووک؛ بیچکەلانە؛ بوچکەلە 🇮🇷 کوچولو

**چکۆ** / ç(i)ko/: ئامراز. چون؛ چونکاتێ؛ بۆیە؛ لە بەر ئەوە 🇮🇷 زیرا

**چکۆلانە** / ç(i)kolane/: ☜ **چکۆڵانە**

**چکۆلە** / ç(i)kole/: ☜ **چکۆڵە**

**چکۆلەیی** / ç(i)koleyî/: ☜ **چوکێتی**

**چکۆڵانە** / ç(i)kołane/: ئاوەڵناو. چکۆلانە؛ بچکۆلە؛ بووچلانە؛ گولالە؛ بیچکەلە 🇮🇷 کوچولو

**چکۆڵۆکە** / ç(i)kołoke/: ☜ **چکۆڵە**

**چکۆڵە** / ç(i)kołe/: ئاوەڵناو. چکۆلە؛ چکۆڵۆکە؛ چکوولە؛ چکۆلانە؛ چکەلە؛ چکەڵە؛ بچووک؛ بووچک ‹چەن چکۆڵەن پەلەوەر لەو بەرزە/ ئاخ کە چەن خوێڕیگرە ئەو عەرزە «سوارە»› 🇮🇷 کوچک

**چکۆڵەیی** / ç(i)kołeyî/: ناو. پچووکی؛ وەردکەک؛ بووچکی؛ گچکەیی 🇮🇷 کوچکی

**چکود** / ç(i)kûd/: ☜ **چکوس**

**چکوودی** / ç(i)kûdî/: ناو. ڕژدی؛ چرووکی؛ چکووسی 🇮🇷 خِسّت

**چکوراندن** / ç(i)kûrandin/: چاوگ. ۱. هەڵمساندن؛ با پێ‌کردن ۲. گرژ و چیندار کردن 🇮🇷 ۱. آماساندن ۲. چروک کردن

**چکورین** / ç(i)kûrîn/: چاوگ. شەپۆل لێدان 🇮🇷 موج زدن

**چکوس** / ç(i)kûs/: ئاوەڵناو. چکوود؛ چرووک؛ چورپک؛ ڕژد؛ لەچەر؛ کوورقوش؛ دەس‌وشک؛ نگریس؛ نەتڵ؛ بزگیر؛ دەس‌قووچاو؛ قیرسیچم؛ قرتن؛ قومش؛ خوس؛ کۆرنان؛ کوێرنان؛ دەخس؛ چاوتەنگ؛ بەرچاوتەنگ؛ وشکەهەوەڕ؛ خۆ دوورگر لە خەرج کردن و بەخشین ‹بەدخووم و لە ڕاستە خۆم چکووسم/ سی ساڵە گوناهی خۆم دەنووسم «هەژار، مەموزین»› 🇮🇷 خسیس

**چکووسی** / ç(i)kûsî/: ناو. ڕژدی؛ ماڵپارێزی؛ چرووکی؛ چکوودی 🇮🇷 خِسّت

**چکولە** / ç(i)kûle/: ☜ **چکۆڵە**

**چکە** / ç(i)ke/: ناو. دلۆپەی داکەوتوو 🇮🇷 چکّه

**چکەچک** / ç(i)keçik/: دەنگەناو. دەنگی لە سەر یەک داکەوتنی دلۆپە 🇮🇷 صدای چکیدن پیاپی مایع

**چکە ـ چکە** / ç(i)ke ç(i)ke/: ئاوەڵکار. وردە ـ وردە؛ کەم ـ کەمە 🇮🇷 اندک ـ اندک

**چکەلانە / ç(i)kelane/**: ناو. چکەلانینە؛ کـەمووک ▬ اندک

**چکەلانینە / ç(i)elanîne/**: ☜ **چکەلانە**

**چکەلە / ç(i)kele/**: ☜ **چکۆڵە**

**چکەڵە / ç(i)keĺe/**: ☜ **چکۆڵە**

**چکی¹ / ç(i)kî/**: نـاو. ١. جـوامێری و ئازایـەتی ٢. منەت ٣. سەرکۆنە؛ لۆمە ٤. برک؛ ژان و برک ▬ ١. جـوانمردی و دلیـری ٢. منّـت ٣. سـرزنش ۴. شکم‌درد

**چکی²**: ئاوەڵکار. لە گۆترە؛ بـێ‌کێشـان و پێـوان ▬ تخمینی

**چکیان / çikyan/**: ☜ **چکان**

**چکیای / çikyay/**: چاوگ. چکان؛ تکان ▬ چکیدن

**چکیڕ / ç(i)kîř/**: ناو. نینۆک؛ ناخون ▬ ناخن

**چکین / ç(i)kîn/**: چاوگ. وشک بوون ▬ خشکیدن

**چکێ / ç(i)kê/**: ئاوەڵـکار. چکێک؛ کەمێ؛ کەمێک؛ کەمووسکەیەک ‹چکێکم خوارد› ▬ اندکی

**چکێک / ç(i)kêk/**: ☜ **چکێ**

**چگزین / çigzîn/**: چاوگ. بە شک بوون؛ بەدگومان بوون ▬ شکّاک بودن

**چگووڕاندن / ç(i)gûřandin/**: چاوگ. هەڵمسـاندن؛ تووڕە کردن ▬ عصبانی کردن

**چل¹ / çil/**: نـاو. سی و دە؛ ژمارەی سەرەکی پـاش سی و نۆ و پێش چل و یەک ▬ چهل

**چل²**: ئاوەڵناو. یەکێ زیاتر لە سی و نـۆ دانـە ‹چـل خەم چل خەیاڵ چلیش وەسواسە/ سـێ چـل چـۆن دەرکەم وە یەک هەناسە؟! «فولکلۆر»› ▬ چهل

**چل ـ³**: پێشوشـە. ١. زۆر؛ زل ‹چـل‌درۆ› ٢. کـامڵ ‹چل‌تیکە؛ چل‌چرا؛ چل‌چنگ› ▬ ١. زیـاد ٢. چهـل؛ تکمیل

**چلاب / ç(i)lab/**: نـاو. زریـزەی ئاڵـتوون ▬ زنجیـر طلا

**چلاپە / ç(i)lape/**: ناو. قەڵەمباز؛ بازی بە تەوژم ▬ پرش

**چلاسک / ç(i)lasik/**: ناو. ١. شـەتڵ؛ گیایـەک کـە هەڵدەقەندرێ و لە شوێنێکی تر دەنێژرێتـەوە ٢. چلۆسک؛ بزووت؛ نیوەسووتاو ▬ ١. نشا ٢. نیمسوز

**چلاک / ç(i)lak/**: نـاو. چـلاک؛ ئـامرازێ لـە چێـو، پلاستیک یا کانزا بۆ هەڵواسینی جل‌وبـەرگ کـە لۆچ نەبێ ▬ چوبرختی

**چلانن / ç(i)lanin/**: چاوگ. شـێلان؛ داماڵـین بـە دەست؛ پێداهێنانی بە قەو ▬ چلاندن

**چلبەردە / çilberde/**: ناو. چلدانە: ١. یارییەکە چل کوچک بە شوێن یەکدا هەڵـدەگرنەوە ٢. کـاری بەرد بە کێلە قەبرەوە نان بۆ بەخت تاقی کردنەوە ▬ ١. نوعی بازی گروهی ٢. نوعی فالگیری با سـنگ قبر

**چل‌تیکە / çiltîke/**: نـاو. ١. جـۆرێ وەرپاییـە لـە کاموا یان پەڕۆی ڕەنگاوڕەنگ دروسـتی دەکـەن ٢. ڕانک و چۆخەی پارچـەیی کـە وەک بـووزوو شوێن-شوێن دەکرێ ٣. هەر شتێک لە پـەڕۆی ڕەنگاوڕەنگ و لەت‌وکوت دروست بکرێـت وەک: لێفە و پەردە و ... ٤. جۆرێ نارنجۆکی چل‌تیکـە ▬ ١. پادری از پارچەی رنگارنگ ٢. لباسی کەماننـد شال تکە ـ تکە بدوزند ٣. هر چیـزی کـە از بـە هـم دوختن پارچەهای رنگارنگ سازند ۴. نـوعی نارنجـک جنگی

**چلچرا / çilç(i)ra/**: ناو. لووستر؛ چـرای چەنـد لـق کە لـە مزگـەوت و ماڵـەگەوراندا هەڵـدەکرێ ▬ چلچراغ

**چلچلی / çilç(i)lî/**: ناو. هـۆکی جـوانی و جاهێلـی ‹پای ناوەتە ناو پەنجا، تازە ئەوەڵ چلچلـی کردنیـە!› ▬ هوای جوانی

**چلچنگ / çilçing/**: نـاو. شە؛ شانەی سەر داهێنـان ▬ شانەی سر

**چلچەنگ / çilçeng/**: نـاو. قولاپێکە چـوار سـەر بـۆ

دەرهێنانەوەی شتی دە چالاو کەوتوو ☰ چاەیوز

**چلخت / çilxit/**: ناو. ملەی کێو؛ شانی کەژ؛ کەنارەی چیا ☰ ستیغ کوه

**چلدانە / çildane/**: ☜ **چلبەردە**

**چلدرۆ / çild(i)ro/**: ئاوەڵناو. زۆر درۆزن ☰ خالی‌بند

**چلفراندن / çilf(i)randin/**: چاوگ. دڕاندن؛ شڕ کردن ☰ پارە کردن

**چلفرین / çilf(i)rîn/**: چاوگ. دڕان؛ شڕ بوون ☰ پارە شدن

**چلفڕا / çilf(i)ȓa/**: ناو. جەرگ و دڵی سوورەوەکراو لە ڕۆندا ☰ دل و جگر سرخ شده

**چلڤلین / çilv(i)lîn/**: چاوگ. چریسکین؛ برووسکە دانەوە ☰ درخشیدن

**چلڤۆک / çilvok/**: ئاوەڵناو. بەبریقە؛ برووسکەدار ☰ درخشان

**چلک / çilk/**: ناو. چلە ☰ چلّە

**چلکدار / çilkdar/**: ناو. چلەدار؛ ژن لە چلەی منال بووندا ☰ زائو در ایّام چلّە

**چللک / çillik/**: ناو. پۆلا ☰ فولاد

**چللە / çille/**: ناو. چلوو؛ چلەی زستان ☰ چلّەی زمستان

**چللی / çillî/**: ناو. ئەو هەودایەی برینی پێ دەدروونەوە ☰ نخ بخیه

**چلم / çilm/**: ☜ **چلەم**

**چلمساندن / çilm(i)sandin/**: ☜ **چرمساندن**

**چلمسی / çilm(i)sî/**: ئاوەڵناو. جلوا؛ ژاکاو؛ سیس؛ سیس‌هەڵگەڕاو ☰ پژمُرده

**چلمسین / çilm(i)sîn/**: چاوگ. ژاکان؛ سیس هەڵگەڕان ☰ پژمُردن

**چلمێر / çilmêr/**: ناو. چلمێردە؛ چلمێرە: ١. شەوژەن؛ شەوبەن؛ چۆڵەپێچەن؛ داری پشت درگا بۆ قایم کردن ٢. لۆسەی درێژی دارین؛ مەڵغەی دارین کە بۆ بەرز کردنەوەی شتی گران بە کار دێت ☰ ١. کلون در ٢. اهرم چوبی

**چلمێردە / çilmêrde/**: ☜ **چلمێر**

**چلمێرە / çilmêre/**: ☜ **چلمێر**

**چلنگە / ç(i)linge/**: دەنگەناو. نووزە ـ نووزی سەگ لە بەر ئازار ☰ زوزەی دردمندانەی سگ

**چلوان / çilwan/**: ناو. چلەکانی زستان ‹مانگی کانوونێ بە چلوان دەرکرام/ وەک برایم لەو ولاتە ڕاو نرام «هێمن»› ☰ چلەهای زمستان

**چلوسک / ç(i)lusk/**: ناو. داری نیوە سووتاوی بە گڕ؛ بزووتی ئایساو ☰ هیزم نیم‌سوخته

**چل‌وفل / çil û fil/**: ئاوەڵناو. چلێس؛ نەوسن؛ زۆرخۆر؛ زکن؛ زکەڕۆ ☰ شکم‌پرست

**چلومی / ç(i)lumî/**: ☜ **چلەمی**

**چلۆ / ç(i)lo/**: ناو. ١. چڕوو؛ لکە داری یەکساڵە ٢. لکە بی و چناری هەڵپەرتاوتە ☰ ١. نهال یک‌ساله ٢. شاخەی هرس‌شدەی بید و چنار

**چلۆمین / ç(i)lomîn/**: ☜ **چلەمین**[2]

**چلۆن**[1] **/ ç(i)lon/**: ئاوەڵناو. چۆن؛ کلۆن؛ چاوا؛ کوو ‹چلۆن خاتوونێکە؟› ☰ چگونه

**چلۆن**[2]: ئاوەڵکار. چۆن؛ کلۆن ‹چلۆن قسە دەکا؟› ☰ چگونه

**چلۆنایەتی / ç(i)lonayetî/**: ناو. چۆنایەتی؛ چۆنیەتی؛ حاڵەت، دۆخ یان تایبەتمەندی شتێک یا کەسێک (وەک: باشی، خراپی، گەرمی، ساردی، سەختی، نەرمی، بەرزی، نزمی، کوتایی و...) ‹لە چلۆنایەتی بارودۆخمان مەپرسە!› ☰ چگونگی

**چلۆنک / ç(i)lonik/**: ناو. چڵەپۆپەی دار ☰ شاخەی بالایی درخت

**چلۆنەتی / ç(i)lonetî/**: ☜ **چۆنیەتی**

**چلۆنەکایەتی / ç(i)lonekayetî/**: ☜ **چلۆنها**

**چلۆنها / ç(i)lonha/**: ئاوەڵکار. بەدەگمەن؛ جاروبارە؛ چلۆنەکایەتی ‹چلۆنها بێت بۆ ئێرە› ☰ بە نُدرت

**چلـو / ç(i)lû/:** نـاو. ۱. ☜ **چللـە** ۲. مـەودای بێنوێژی ژن دوای منال بوون ئەگەرچی لە چـل ڕۆژیـش کـەمتر بێـت ⚐ ۱. ☜ **چللـە** ۲. مـدت قاعدگی زن پس از زایمان

**چلووبڕ / ç(i)lûbiř/:** ☜ **چلەبڕ**

**چلوور / ç(i)lûr/:** ناو. شێلاقە ⚐ گیلانشاه

**چلـوورە / ç(i)lûre/:** نـاو. ۱. زەمبلـە؛ زەمبـەلیلک؛ شووشە سەهۆڵ؛ شووشەسـۆڵ؛ قەنـدیل؛ کلیلـە؛ گلیزە؛ بەلیسە؛ سوولەڕمە؛ زەمـەگلێرە؛ ژەکلێـرە؛ سەهۆڵێ کە بە شاخ و گوێسوانەدا شۆڕ دەبێتـەوە ‹دێم بەرەو بەفر و چلوورە و بەستەلـەک/ دێم بـەرەو شـیخاڵ و ڕێچکـە و ڕەشـبەلـەک «هـێمن»› ۲. بەسـتەنی؛ دۆندرمـە ۳. چلووسـک؛ بـزووت؛ چیلکەی سەر بـە ئـاور ⚐ ۱. دنگالـە ۲. بسـتنی ۳. چوب نیم‌سوز

**چلووسک / ç(i)lûsk/:** ☜ **چۆڵەچرا**

**چلووک / ç(i)lûk/:** ناوەلـناو. چلکن؛ گەمار؛ پیس ⚐ چرکین

**چلـووگیر / ç(i)lûgîr/:** نـاو. بـارودۆخی نـەخۆش کەوتنی ساوا لـە تەمـەنی چـل ڕۆژەدا ⚐ حالـت مریض شدن نوزاد چهل روزه

**چلـە / ç(i)le/:** نـاو. ۱. کـاری چوونـە ئەشـکەوتی سـۆفی بـۆ چـل ڕۆژ ۲. چلەگـەورە؛ چـل ڕۆژی هەوەڵی زستان ۳. چلەی چووکـە؛ بیسـت ڕۆژی ئاخری مانگی دووهەمی زستان ٤. بیسـت ڕۆژی ناوەڕاستی هاوین ٥. پرسەی مـردووو دوای چـل ڕۆژ ٦. کاری بەزم گرتن و نان دانی چل ڕۆژی لە دایک بوونی منداڵ ۷. چل ڕۆژ پاش منال بـوون ⚐ چلّە: ۱. چلّـەی مُرتاضـان و درویشـان ۲. چلّـەی بزرگ ۳. چلّەی کوچک ۴. چلّەی تابسـتان ۵. چهلـم مرگ کسی ۶. مراسم روز چهلم تولد کودک ۷. چهل روز بعد از وضع حمل

■ **چلە بووچکد:** ☜ **چلە بەچە**

**چلە بەچە:** چلە بووچک؛ چلە پچـووک؛ چلـەی چووکە؛ بیست ڕۆژی ئاخری مانگی دووهـەمی زستان ⚐ چلەی کوچک

**چلە پچووک:** ☜ **چلە بەچە**

**چلە گەورە:** چلەی بەرین؛ چلـەی گـەورە؛ چـل ڕۆژ لە هەوەڵی زستان ⚐ چلەی بزرگ

**چلەی بەرین:** ☜ **چلە گەورە**

**چلەی گەورە:** ☜ **چلە گەورە**

**چلەی هاوین:** جەنگەی هاوین؛ قرچەی تاوسـان؛ گەرماهی هاڤین ⚐ چلّەی تابستان

⊡ **چلە دەرکردن:** *[ڕێ‌وڕەسمی کۆن]* گرتنی جێـژنی چلـەمین ڕۆژی زان، کـە زەیسـانیان دەبـردە گەرماو و لەگەڵ بەزم و جەژندا بەڕێوە دەچـوو ⚐ چلّەبران گرفتن

**چلە کێشان:** چلە نیشتن؛ چل ڕۆژی بەردەوام لە شوێنێکدا نـوێژ و سـکاڵا کـردن و شـتێکی وا نەخواردن ⚐ چلّە نشستن

**چلە گرتن:** چلەی مردنی کەسێ گـرتن ⚐ چلّـە گرفتن

**چلەبڕ / ç(i)lebiř/:** ناو. چلووبڕ؛ باڵدارێ کە زووتـر لە کاتی خۆی لە گەرمیان دێتەوە ⚐ پرندەای کـە زودتر از معمول از گرمسیر بازگردد

**چلەپایـە / ç(i)lepaye/:** نـاو. جۆلانـە؛ جۆلانـێ؛ داردیلەکانێ؛ داردلەکانێ ⚐ تاب

**چلەخانـە / ç(i)lexane/:** ناو. ئـەو ئەشـکەوت یـان ژوورە سۆفی چلەی تێدا دەکێشێ ⚐ چلّەخانە

**چلەدار / ç(i)ledar/:** ☜ **چلکدار**

**چلەشۆر / ç(i)leşor/:** نـاو. ۱. ڕێژنـە بـارانی پـاش چلەی زستان ۲. وسڵی دوای چلـوو ⚐ ۱. بـاران پس از چلەی زمستان ۲. غُسل پس از چلّە

**چلەکێشی / ç(i)lekêşî/:** ناو. خەڵوە؛ تەنیا ڕابواردنی سۆفی بۆ چلەکێشان ⚐ چلەنشینی

**چلـەم / ç(i)lem/:** ناوەلـناو. چلهـەم؛ چلهـەمین؛

چلەمین؛ چلم؛ بە ڕیز، پلە یان پێگەی چلەوە ☰ چهلُم

**چلەمی** / ç(i)lemî/: جێناو. چلومی؛ ئەوی لە ڕیز، پلە یان پێگەی چلەمدایە ☰ چهلُمی

**چلەمین**[1] / ç(i)lemîn/: ناو. چلهەم؛ چلهەمین: ١. چل ڕۆژ دوای کۆچی دوایی کەسێ ٢. ڕێوڕەسمێ کە بەم بۆنەوە بەڕێوە دەچێ ☰ ١و٢. چهلُم

**چلەمین**[2]: ئاوەڵناو. چلۆمین؛ بە ڕیز، پلە یان پێگەی چلەمەوە ‹ئەوە چلەمین کەس بوو› ☰ چهلُمین

**چلەورج** / ç(i)lewirç/: ناو. لە ڕۆژی بیست و پێنجی بەفرانبارەوە تا پێنجەمی ڕەشەمە ☰ از بیست و پنجم دی تا پنجم اسفند ماه

**چلهەم** / çilhem/: ☜ چلەمین[1]

**چلهەمین** / çilhemîn/: ☜ چلەمین[1]

**چلی** / ç(i)lî/: ناو. ١. چلەی زستان ٢. چلەی هاوین ☰ ١. چلّەی زمستان ٢. چلّەی تابستان

**چلیان** / çilyan/: چاوگ. ١. هەڵخلیسکان؛ خلیسکان؛ شەمتین ٢. ڕێک کەوتن؛ ئامادە بوون؛ ساز بوون ٣. جێبەجێ بوون ☰ ١. لیز خوردن ٢. مُهیا شدن ٣. انجام شدن

**چلیچلی** / ç(i)lîç(i)lî/: ناو. ١. چڵ؛ چەکچەکی؛ شەمشەمەکوێرە ٢. باڵدارێکی چکۆلەی زەردە ☰ ١. شبپره ٢. پرندەای کوچک زردرنگ

**چلیک** / ç(i)lîk/: ناو. ١. تووەزەمینە؛ تووەفەرەنگی ٢. ئاسنی ساغ و باش ☰ ١. توتفرنگی ٢. آهن خالص و ناب

**چڵ**[1] / çił/: ناو. ١. لکی دار ‹لە سەر چڵی سوورەگوڵ/ بلبل دەخوێنێ بەکوڵ «هێمن»› ٢. سەر ترۆپکی چیا و دار ٣. قلە گیا ‹چلە ڕێحانی دوورە دێراوم/ سازی ناسازی هەڵپەسێراوم «هێمن»› ٤. چلیچلی؛ شەمشەمەکوێرە؛ چەکچەکی ٥. پت؛ نەبز ٦. چچک؛ سەری گوان ٧. ئێش؛ ژان ☰ ١. شاخەی درخت ٢. بالاترین نقطەی کوه و درخت ٣. ساقەی گیاه ۴. شبپره ۵. نبض ۶. نُک پستان ٧. درد

⊡ **چڵ دان**: ١. پت دانی دەمار ٢. چڵ وەشاندن/ وەشانن؛ پت دانی برین ‹بەلام دەردێو تەر جا گرتەن نە دڵ/ نەک چوون ئێفتەر دەرد دڵ پێش مەدۆ چل «مەولەوی»› ٣. ئێشان؛ ئێشیان ☰ ١. نبض زدن ٢. تیر کشیدن زخم ٣. درد کردن

**چڵ وەشانن**: ☜ چڵ دان ـ٢

**چڵ**[2]: ئاوەڵناو. ١. گێلۆکە و کەمزان ٢. چلێس؛ نەوسن ٣. درووس؛ تەواو ☰ ١. هالو ٢. شکمو ٣. تمام؛ کامل

**• چڵ**[3]: پاشەوشە. ئاوەڵناو دروست دەکا ‹نیوەچڵ› ☰ پسوند صفت‌ساز؛ ـ ناقص

**چڵاک** / ç(i)łak/: ناو. ١. نەمام؛ ڕیشەی ناژتن ٢. کۆلەکەی چادر ٣. داری درێژی بەر تەکاندن ٤. ☜ چلاك ☰ ١. نهال ٢. دیرک خیمه ٣. چوب ثمرتکانی ۴. ☜ چلاك

**چڵانن** / ç(i)łanin/: چاوگ. ساز دان؛ ئامادە کردن ☰ مُهیا ساختن

**چڵانە** / ç(i)łane/: ناو. ١. کار و ڕەوتی بە مالانەوە گەڕان و خۆراک وەرگرتن ٢. [کینایە] گەدایی ☰ ١. کاسەگردانی ٢. گدایی

**چڵاو** / ç(i)ław/: ناو. وشکەپلاو؛ هیشکەپلاو؛ برینجی ئاوکێش کراوی دەمکێشراو لەگەڵ کەرە یان ڕۆن و خوێدا کە بە خۆرشت یان کەبابەوە دەیخۆن ☰ چلو

**چڵاوچڵ** / ç(i)ławçił/: ئاوەڵکار. لەم چڵ بۆ ئەو چڵ؛ دارەودار ‹لەگەڵ کازیوە بۆی نەفرم چلاوچڵ/ نەبینم گوڵ، چلۆن نارام دەبێ گوڵ «هێمن»› ☰ شاخه‌به‌شاخه

**چڵاوخۆرشت** / ç(i)łaxorişt/: ناو. چێشتێکی بریتی لە چلاو و یەکێک لە خۆرشتەکان (وەک: قیمە

یان سەوزی) ☰ چلوخورشت

**چڵاوکەواو** / ç(i)ławkewaw/: ☜ **چڵەوکەباب**

**چڵپاندن** / çiłpandin/: چاوگ. ١. ☜ **چڵپـانن** ٢. فێڵ و فەرەج کـردن ٣. لـێ کردنـەوە ☰ ١. ☜ **چڵپانن** ٢. نیرنگ ساختن ٣. جُدا کردن

**چڵپانن** / çiłpanin/: چاوگ. چڵـپاندن: ١. مـژین؛ هەڵمژین (وەک: مژینی مەمک بە هەڵپە و پەلە) ٢. ئاو خواردنەوەی سەگ ☰ ١. با حرص مُک زدن ٢. آب خوردن سگ

**چڵپاو** / çiłpaw/: ناو. قوڕ و لیتـە؛ حـەڕی تـراو ☰ گل و لای

**چڵپولیس** / çiłp û lîs/: دەنگەناو. چڵـپولـێس؛ دەنگی ئاو خواردنەوەی سەگ و پشیلە ☰ صدای آب خوردن سگ و گربه

**چڵپولێس** / çiłp û lês/: ☜ **چڵپولیس**

**چڵپە** / çiłpe/: دەنگەناو. ١. دەنگی خواردنـەوە بـە پانـایی زمـان ٢. دەنگـی خواردنـەوەی سـەگ و پشی ☰ ١. صـدای لـیس زدن ٢. صـدای آشـامیدن سگ و گربه

**چڵپەچڵپ** / çiłpeçiłp/: دەنگەناو. چڵپەی زۆر و بـە شوێن یەکدا ☰ صدای لیس زدن متوالی

**چڵپەخۆر** / çiłpexor/: ئاوەڵـناو. *[کنایە]* خـۆفرۆش؛ نۆکەری بێگانە ☰ خودفروش

**چڵپەلیسی** / çiłpelîsî/: ناو. *[پلار]* چڵپەلێسی؛ کار و ڕەوتی داهاتی کەم و نـاڕەوا دەسـت خسـتن بـە ڕواڵەت لە ڕێگای قانوونییەوە ☰ لفت‌ولیس

**چڵپەلێسی** / çiłpelêsî/: ☜ **چڵپەلیسی**

**چڵتوک** / çiłtûk/: ☜ **چەڵتوک**

**چڵتوکجاڕ** / çiłtûkcař/: ☜ **چەڵتوکجاڕ**

**چڵچـەنگ** / çiłçeng/: نـاو. چڵچـەنگ؛ قولاپـە ئاسنێکە دەگەڵ تەڵەدا، ئەگەر تەڵە تەقی و نچیر بردی لە زەوی دەگیرێ ☰ قلاب آهنی تله

**چڵخـوس** / çiłxûs/: ئاوەڵـناو. چکـووس؛ ڕژد ☰ خسیس

**چڵدسە** / çiłd(i)se/: ناو. ئارژەنگ بادامی؛ کێوی ☰ بادام کوهی

**چڵک** / çiłk/: ناو. ١. گـەمار؛ قریـژ؛ تـۆز و خۆڵـی تێکەڵ بە چەوری کە لە شتی تر دەئالێ ‹چڵـکی دەسـتە مالـی دنیـا وەک دەڵـێن/ مالپەرسـت پەیمان‌شکێنە و بێ‌بەڵێن «هـێمن»› ٢. تەوشـێکی زۆرتر زەرد و بـرێ جـار خوێنـاوی کـە لـە بـرێ برینەوە دەردێ ٣. چڵ؛ پت؛ نەبز ٤. چێڵ؛ ماکەو ☰ ١. چرک ٢. عفونت زخم ٣. نبض ۴. کبک ماده

⊡ **چڵک دان:** لێدانی ڕەگ ☰ نبض زدن

**چڵک کردن:** کێم و زووخ هێنانی برین ☰ عفونت کردن زخم

**چڵکاو** / çiłkaw/: ناو. ١. پاشاراو؛ پاشـاو؛ پاشـەراو؛ ئاوێ کە جارێک شتی چڵکنی تێـدا شـۆرابێ ٢. ئاوی پیس بە تێکڕایی ☰ ١. چرکاب ٢. آب کثیف

⊡ **چڵکـاو خـواردن:** *[پلار]* پاشـخوان خـواردن؛ خـۆ فرۆشتن ☰ خودفروشی کردن

**چڵکاوخۆر** / çiłkawxor/: ئاوەڵناو. *[پلار]* ١. نۆکەر و کارەکـەری بـێ‌نـرخ و بـێ‌قـەدر ٢. خـۆفرۆش؛ نۆکەری بێگانە ‹چڵـکاوخۆرانی ئیمپریـالیزم› ☰ ١. خدمتکار بی‌مقدار ٢. خودفروش

**چڵکبەر** / çiłkber/: ناو. دژەچڵک؛ چڵک وشک‌کەر ☰ آنتی‌بیوتیک

**چڵکتاو** / çiłktaw/: ☜ **چڵکهەڵگر**

**چڵکشۆر** / çiłkşor/: ☜ **چڵکەسو**

**چڵکمردە** / çiłkmirde/: ☜ **چڵکەسو**

**چڵکمریا** / çiłkmiřya/: ☜ **چڵکەسو**

**چڵکن** / çiłkin/: ئاوەڵـناو. گـەمار؛ پـیس؛ پـۆخڵ؛ چرکین؛ کۆتی ☰ کثیف

**چڵکنوس** / çiłknûs/: ☜ **پێشنوس**

**چڵکنی** / çiłk(i)nî/: ناو. گەماری؛ پیسی ☰ کثافت

**چڵکەسـو** / çiłkesû/: ئاوەڵـناو. چڵـکشـۆڕ؛

چلکمردە؛ چلکمڕیا؛ دکین؛ بە ڕەنگ و ڕووی چلکنەوە کە بە شۆردن پاک نەبێتەوە 🇮🇷 چرکمُردە

**چلکهەڵگر / çiłkhełgir/**: ناوەڵناو. چلکتاو؛ بە ڕەنگێ کە چلکی پێوە دیار نەبێ 🇮🇷 چرکتاب

**چڵم / çiłm/**: ناو. ١. کلم؛ خلم؛ چرم؛ ئاوی خەستی کەپۆ ٢. *[کنایە]* بڕیتی لە نەبەگە و خۆنەگرتی 🇮🇷 ١. خلم ٢. کنایە از شُل و ول

▣ **چڵم بە کەسێکدا نەساوین:** *[مەجاز]* ئاوڕ لە کەسێک نەدانەوە؛ کەسێ بە هیچ نەزانین ‹لەو ماڵە چلمەکەشیان بە ئێمەدا ناساون› 🇮🇷 کسی را قابل ندانستن

**چڵماس / çiłmas/**: ☜ چاوبرسی

**چڵمن / çiłmin/**: ناوەڵناو. چلمە؛ چرمن؛ کلمن؛ کلمیشۆک؛ خلمن؛ مفوو؛ فلقن؛ بلقن؛ لووت بە چلمەوە 🇮🇷 خلمو

**چڵمە / çiłme/**: ☜ چڵمن

**چڵمەچڵم / çiłmeçiłm/**: ناو. فمەفم؛ دۆخی چلم هەڵلووشینی لە پەستا 🇮🇷 حالت پی‌درپی دماغ را بالا کشیدن

**چڵمەلەتە**[1] **/ çiłmelete/**: ناو. دەنکی شلک و خۆنەگرتووی بادام و گوێز و قەیسی 🇮🇷 هستەی نارس بادام و گردو و ...

**چڵمەلەتە**[2]: ناوەڵناو. شل و خۆنەگرتی ‹بێچووەکەی جارێ چلمەلەتە بوو، خستی› 🇮🇷 شُل و نارسیدە

**چڵوپۆپ / çił û pop/**: ناو. لەق‌وپۆ 🇮🇷 شاخ و برگ

**چڵوچێو / çił û çêw/**: ناو. دڕک و داڵ؛ چیلکە و چاڵ ‹کە دولبەر بادەنۆشی کا، ئەبێ مـن خزمەتی مێوکەم/ بە شەو ئاودێری باخات و بە ڕۆژ دەفعی چڵ‌وچێو کەم «قانع»› 🇮🇷 خس و خاشاک

**چڵۆپک / ç(i)łopik/**: ☜ چڵۆپە

**چڵۆپە / ç(i)łope/**: ناو. چڵۆپک؛ چڵووک؛ بەرزترین شوێنی دار 🇮🇷 بلندترین نقطەی درخت

**چڵۆسک / ç(i)łosk/**: ناو. چڵۆسکە؛ چۆڵەچرا 🇮🇷 مشعل

**چڵۆسکە / ç(i)łoske/**: ☜ چڵۆسك

**چڵوزنای / ç(i)łûznay/**: چاوگ. داخ پێوە نان 🇮🇷 داغ گذاشتن

**چڵوزیای / ç(i)łûzyay/**: چاوگ. چزران؛ چزیان 🇮🇷 داغ شدن

**چڵووسک / ç(i)łûsk/**: ☜ چلیسك

**چڵووک / ç(i)łûk/**: ☜ چڵۆپە

**چڵە**[1] **/ ç(i)łe/**: ناو. دۆخی پەڕینی پێلووی چاو 🇮🇷 حالت پریدن پلک چشم

**چڵە**[2]: ناوەڵناو. خۆراکی؛ شیاوی خواردن 🇮🇷 خوردنی

**چڵە**[3]: پێرۆ. ← چاوچڵە

**چڵەبەنان / ç(i)łebenan/**: ناو. کاری هەڵدانی چەند چادر لە پاڵ یەکەوە وا کە بوار نەمێنێ 🇮🇷 برپا کردن پهلو به پهلوی خیمەها

**چڵەپاندن / ç(i)łepandin/**: چاوگ. ١. *[پەلار]* دەنگ دەرهێنان و دەم تەقاندن بە دەم خواردنەوەوە ٢. ئاو خواردنەوەی سەگ 🇮🇷 ١. هورت کشیدن ٢. آب خوردن سگ

**چڵەپنای / ç(i)łepnay/**: چاوگ. ١. *[پەلار]* خواردنەوەی سەگ‌ئاسایی و بە هەڵپە ٢. بە پەلە مژین 🇮🇷 ١. لە ـ لە زدن و هورت کشیدن ٢. مکیدن با شتاب

**چڵەپۆپە / ç(i)łepope/**: ناو. ١. چڵۆپە؛ چڵووک؛ بلندترین شوێنی دار ٢. ترۆپ؛ ترۆپک؛ هەرە بلندایی 🇮🇷 ١. بالاترین نقطەی درخت ٢. بلندترین نقطە

**چڵەپووش / ç(i)łepûş/**: ناو. پڕ؛ چڵەکا 🇮🇷 خَس

**چڵەچڵ / ç(i)łeçił/**: ناو. ١. کولەکولی گەرما؛ تین و تاوی زۆر سەختی گەرمای هاوین ٢. تین و هالاوی ئاگر 🇮🇷 ١. گرمای شدید هوا ٢. هُرم آتش

**چڵەدان / ç(i)łedan/**: ناو. ١. جیقەڵدان؛

جیکلدانی مەل ۲. *[پلار]* ورگ و زگی فرەخۆر ☰ ۱. ژاغر ۲. شکم پُرخور

**چڵەک / ç(i)łek/**: ئاوەڵناو. ۱. سڵ؛ قوشقی؛ سرک؛ ڕەوەک؛ بەیدەس ۲. *[پلار]* زکن؛ زۆرخۆر؛ فرەخۆر ☰ ۱. رموک ۲. پرخور

**چڵەکا / ç(i)łeka/**: ناو. پـڕ؛ قـرش؛ چڵـەپووش ☰ خَس

**چڵەکان / ç(i)łekan/**: چاوگ. چڵەکیان؛ خورپـان؛ شڵەژان ☰ یکّه خوردن

**چڵەکنایەرە / ç(i)łeknayere/**: چاوگ. داچڵەکاندن ☰ شُکّه کردن

**چڵەکیان / ç(i)łekyan/**: ☜ چڵەکان

**چڵەکیانەوە / ç(i)łekyanewe/**: چاوگ. داچڵەکیان ☰ یکه خوردن

**چڵەکیایەرە / ç(i)łekyayere/**: چاوگ. داچڵـەکان ☰ شُکه شدن

**چڵەگە / ç(i)łege/**: ناو. چـەلاکی چـادر ☰ ستون چادر

**چڵەنۆک / ç(i)łenok/**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* خیپشـە؛ باوەعومرە ☰ کوتوله

**چڵەوکەباب / ç(i)łewkebab/**: ناو. چلاوکـەباو؛ خۆراکێکی ئێرانی بریتی لە چـلاو و کـەبابێ کـە جیـاواز سـاز دەکـرێ و پێکـەوە دەخـورێ ☰ چلوکباب

**چڵەوەزی / ç(i)łewezî/**: ☜ چزڵێك

**چڵیان / çiłyan/**: چاوگ. ۱. پەڕینی پێلـووی چـاو ۲. ڕاست هاتنی کار ☰ ۱. پریـدن پلـک چشـم ۲. درست شدن کار

**چڵیتاو / ç(i)łîtaw/**: ناو. بەفر و قوڕی تێکـەڵاو ☰ برف و گِل

**چڵیسک / ç(i)łîsk/**: نـاو. چلووسـک؛ بـزووت؛ سەرەبزووت ☰ نیم‌سوز

**چڵیک / ç(i)łîk/**: پێرۆ. ← چەوروچڵێك

**چڵێز / ç(i)łêz/**: ☜ چڵێس

**چڵێس / ç(i)łês/**: ئاوەڵناو. چڵێز؛ چڵـێک؛ نەوسـن؛ چەورە؛ چاوچنۆک بۆ خواردن ‹تـا ژیرێـک بـەجێ ئەچێ بارت/ سەد گـەوج و چڵـێس ئـەدەن ئـازارت «کاک ئەحمەد»›. هەروەها: **چڵێسی** ☰ شکم‌پرست

**چڵێک / ç(i)łêk/**: ☜ چڵێس

**چم / çim/**: ناو. ۱. خونچـە؛ خونچـەی گوڵـووک؛ بشکۆژی درەخت کە هێشتا نـەبووە بـە گـوڵ ۲. سم؛ نینۆکی چوارپێ ☰ ۱. غُنچه ۲. سُم

**چما / ç(i)ma/**: ئاوەڵکار. چمـای؛ چمانـێ: ۱. بۆچی؛ بۆ؛ بووچە؛ ئەڕا؛ لە بەر چی ‹چما خـەم لـە بـەری؟› ۲. بۆچی؛ ئاخۆ؛ مەگەر ‹چمـا مـن چـاوم نییە؟› ۳. تمەز؛ تمەس؛ تومەز؛ هەر ئێـژی ‹چمـا لە ترسان تۆقیبوو› ☰ ۱. چرا ۲. مگر ۳. انگار

**چمام / ç(i)mam/**: نـاو. چمامـک؛ مەتەڵـۆکە؛ مەتەڵ؛ لیچار؛ مەتهەڵۆک ☰ چیستان

**چمامک / ç(i)mamik/**: ☜ چمام

**چمان[1] / ç(i)man/**: ☜ چەمان

**چمان[2]**: ئاوەڵکار. چمـا: ۱. بـۆچی ‹چـەرخ چـەپ چەنیم ڕاست بەستەن کەڵەک/ چمان سەنگم دان وە مینای فەلەک «یـەعقووب مـیرزا»› ۲. هـەر وەک؛ ئێژی ‹دو زەرع وە یەی زەرع زەمین فەرش کـردوو/ چمان لەشی بی سێ‌ڕۆژ پێش مردوو! «شـامی»› ☰ ۱. مگر ۲. گویی؛ انگار

**چمانێ / ç(i)manê/**: ☜ چما

**چمای / ç(i)may/**: ☜ چما

**چمبل / çimbil/**: ناو. دەستکی هیربـار ☰ دستەی ظروف سفالین

**چمچار / çimçar/**: ناو. جووڵە؛ جموجووڵی لە سەر یەک و لە جێ خۆدا ☰ جنب‌وجوش

⊡ **چمچار بون**: جموجووڵ کردن و نەسرەوتن ‹چ چمچارێکتـە؟ تـاوێ دانیشـە!› ☰ جنـب‌وجـوش داشتن

**چم . چم / çim çim**/: ناو. چـم‌چمـه؛ كه‌لاشـی بن‌چه‌رم ☰ نوعی گیوه‌ی كف چرمی

**چم‌چمه / çimç(i)me**/: ☜ چم - چم

**چمچه / çimçe**/: ناو. ئه‌سكوێ؛ ئه‌سكوو؛ كه‌وچكی دارینی گه‌وره ☰ چمچه

**چمچه‌كۆڵـه / çimçekołe**/: نـاو. كوچكه‌قوڵـــه؛ كلكه‌ته‌شـی؛ به‌چكـه بـۆقی لاق ده‌رنـه‌هاتوو ☰ قورباغه‌ی نابالغ

**چمك / çimk**/: ناو. سووچ؛ قولینچك ‹په‌نجه‌ی نـاز به‌ر بده له چمكی مشكیی شه‌رم/ده‌ركه‌وێ لێوی ئاڵ، زولفی خاو، كولمی نه‌رم «گۆران»› ☰ گوشه

**چمكه / çimke**/: ئاوه‌ڵكار. چونكه؛ بۆیه؛ به هۆی؛ له به‌ر ئه‌وه ☰ چونكه

**چمه / ç(i)me**/: ناو. دونبه‌لان؛ دومه‌لان ☰ دنبلان

**. چن / çin-**/: پاشه‌وشه. ـ چین: ۱. ـ چنه ‹كلاش چن؛ گـــۆره‌وی چـــن› ۲. لێكــــه‌ره‌وه (وه‌ک بـــه‌ری دار) ‹مـازووچن› ۳. ـ چـێن؛ داچـێن ‹تـۆم چـن› ٤. هه‌ڵكه‌ن ‹بژار چن› ٥. هه‌ڵچن ‹تاڵ چـن› ☰ ۱. ـ باف ۲. ـ چین ۳. ـ كار ۴. ـ كش ۵. ـ گُزین

**چنا / ç(i)na**/: ☜ چه‌ناگه

**چنار / ç(i)nar**/: نـاو. ۱. سـوور‌ه‌چنار؛ چنـــاری جه‌وهه‌ردار؛ دارێكی قایم به تۆكڵی لووس و بۆری ئاماڵ‌سه‌وز و گه‌ڵای په‌نجه‌یی‌یه‌وه كـه چێوه‌كـه‌ی به‌نرخـه و بـه كه‌ڵـكی زۆر كـار دێ ۲. سـپیدار؛ سپیندار ☰ ۱. چنار ۲. تبریزی

**چنارۆك / ç(i)narok**/: ناو. گیایه‌كه ☰ گیاهی است

**چناره‌كڵـه / ç(i)narek(i)łe**/: نـاو. چناره‌كه‌ڵـــه؛ چه‌پچه‌پێ؛ گیایه‌كـه لـه مێرگـان شـین ده‌بێ، لاسكی هلۆله و گولێكی زه‌رد ده‌كا، گه‌ڵاكه‌ی له گه‌ڵای سووره‌چنار ده‌چێ ☰ گیاهی است

**چناره‌كه‌ڵه / ç(i)narekełe**/: ☜ چناره‌كڵه

**چناكه / ç(i)nake**/: ناو. چناگـه؛ چه‌نـه؛ چه‌نه‌گـه؛ ئه‌رزینگ ‹حاڵێ له خـوه‌د دیم دوان لـه داڵـگه‌كه‌د/ خوه‌می كوشـتیه خـاڵ چناكه‌گـه‌د «فولكلـۆر»› ☰ چانه

◘ **چناكه دان**/پلار/ چه‌نـه دان؛ زۆربێـژی كـردن؛ چه‌قه‌كه‌ری كردن ☰ وراجی كردن

**چناكه‌شكیاگ / ç(i)nakeşikyag**/: ئاوه‌ڵـناو./پـلار/ زۆربلێی چه‌قه‌سرۆ؛ فره‌وێژ ☰ وراج

**چناكێ / ç(i)nakê**/: ☜ چه‌ناگه

**چناگه / ç(i)nage**/: ناو. ☜ چناكه

**چنان / ç(i)nan**/: ☜ چنران

**چناندن / ç(i)nandin**/: چاوگ. ۱. كون گـرتن بـه ته‌قه‌ڵ ۲. چنین ☰ ۱. رفو كردن ۲. چیدن

**چناو / ç(i)naw**/: ئاوه‌ڵـناو. چنیـاگ؛ چنیـاو: ۱. تـه‌نراو؛ چنـدراو ۲. چێنـدراو؛ وه‌شـیاگ ۳. لـه داره‌وه‌كراو ٤. سه‌ریه‌ک نـراو ☰ ۱. بافتـه شـده ۲. كاشته شده ۳. از درخت چیده شده ۴. روی هم چیـده شده

**چناوكه / ç(i)nawke**/: ☜ چه‌ناگه

**چناوه / ç(i)nawe**/: ناو. چه‌نه؛ ئه‌رزینگ ☰ چانه

**چنته‌ی / çintey**/: ☜ چنین

**چنج / çinc**/: ناو. چنگ؛ چنگاڵ ☰ پنجول

**چنجرۆك / çinc(i)rok**/: نـاو. نینـۆک؛ نـاخون ☰ ناخُن

**چنجری / çinc(i)rî**/: ناو. پارچـه‌ی شـه‌ترەنجی ☰ پارچه‌ی شطرنجی

**چنجرووك / çinc(i)řûk**/: ناو. چنچرووك؛ په‌نجه‌ی به نینۆكی تیژ ☰ پنجول

**چنجك / çincik**/: نـاو. ده‌نـک؛ نـاوک ☰ تخـم و هسته‌ی میوه

**چنجه / çince**/: ناو. توو؛ تۆم؛ تـۆی تروو‌كانـدن ☰ تخمه

**چنچرووك / çinç(i)rûk**/: ☜ چنجرووك

**چنچرۆك / çinç(i)řok**/: ☜ چینچرووك

**چنچك / çinçik**/: نـاو. ۱. گـه‌نمی بـرژاو؛ گـه‌نمی

بریشکه ۲. توو؛ تۆی برژاو ۳. ناوک؛ دەنکی میوه ٤. قوونەڵتس؛ کاری ترووشکان؛ هەڵترووشکان ٥. قنچک؛ پارچەیەکی پچووک له گۆشت ☰ ۱. گندم برشته ۲. تخمه ۳. هسته‌ی میوه ۴. چُمباتمه ۵. قطعه‌ی کوچک گوشت

**چنچکان / çinç(i)kan/**: ناو. چینچکان ☰ چُمباتمه

**چنچکەسڵاو / çinç(i)kes(i)ław/**: ناو. بێتک؛ بووک؛ باپشکێو ☰ گُل‌مُژه

**چنچکەسڵاوە / çinç(i)kes(i)ławe/**: ناو. باپشکێو ☰ گُل‌مژه

**چندران / çind(i)ran/**: ☜ **چنران**

**چندراو / çind(i)raw/**: ناوەڵناو. چنراو؛ تەنراو ☰ بافته

**چندک / çindik/**: ناو. وزاق؛ باز ☰ جهش

**چنران / çinran/**: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //چنرای؛ دەچنرێی؛ بچنرێ// چندران؛ چنان؛ چنیان: ۱. تەنران ۲. ڕنران (وەک بەری دار) ۳. هەڵچنران ☰ ۱. بافته شدن ۲. چیده شدن ۳. روی هم نهاده شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: چنراو/ چاوگی نەرێنی: نەچنران

**چنراو / çinraw/**: ناوەڵناو. چندراو: ۱. تەنراو ۲. هەڵگیراوەوە ☰ ۱. بافته ۲. چیده‌شده

**چنک / çink/**: ناو. ڕیزەوڵ؛ ورتکه نان ☰ خُرده ـ ریزه‌ی نان

**چنکی / çinkî/**: ئاوەڵکار. چونکه؛ چونکاتێ ☰ زیرا

**چنگ[1] / çing/**: ناو. ۱. ئەو بەشە لە دەست کە کۆمەڵی قامکان پێک دێنێ ۲. پەنجەی دڕندە و باڵندە ۳. باڵی مەل ٤. مشت؛ یەکەی هەڵگرتنی شتان ☰ ۱. پنجه ۲. چنگال جانوران ۳. بال پرنده ۴. مشت؛ اندازه‌ی مشت

▣ **چنگ پان کردنەوە:** *(پلار)* دەس داکێشان؛ پارسەکی کردن؛ گەدایی کردن؛ گەدانەدن ☰ گدایی کردن

**چنگ خستن:** ۱. وە دەست هێنان ۲. چنگ گرتن ☰ ۱. به دست آوردن ۲. چنگ گرفتن

**چنگ کەوتن:** گیر هاتن؛ وە دەست هاتن ‹ئێمان بەربوون، ئەیانەوێ/ حەقمان هەرگیز چنگ نەکەوێ «گۆران»› ☰ به دست آمدن

**چنگ گرتن:** پەنجە لێ قایم کردن ☰ چنگ زدن

**چنگ لە ئاسمان گیر کردن:** *(مەجاز)* زۆر تووڕە بوون ☰ بسیار عصبانی شدن

**لە چنگ دەرهێنان:** لە دەست دەرهێنان؛ بە زۆر و گزیکاری لێ‌سەندن ☰ از دست درآوردن

**چنگ[2]:** دەنگەناو. ڕینگە و زرینگەی وێک‌کەوتنی قاپی مس و ... ☰ جرینگ

**چنگار / çingar/**: ناو. قرژانگ؛ قرژاڵ؛ کیفژاڵ ☰ خرچنگ

**چنگاڵ / çingał/**: ناو. چەنگاڵ: ۱. قولاپی لە ئاسن ۲. هەرمێشک؛ جۆرێ چێشت کە بە نانی وردکراو و ڕۆن و شەکر چێ دەبێ ۳. چەتاڵ؛ چەتاڵ؛ ملێبۆک؛ قولاب؛ کولاب؛ لاپوشک؛ ئامرازێکی چوارلەقی هاواڵی کەوچکە لە نان خواردندا ٤. پەنجە و هەنگووسی گیانەوەرانی ڕاوچی ☰ ۱. چنگک ۲. ترید نان و روغن ۳. چنگال غذاخوری ۴. چنگال درنده

**چنگانە / çingane/**: ناو. درمەغ؛ گوڵکێش ☰ چنگک علف

**چنگاوژ / çingawij/**: ئاوەڵناو. لەگژ؛ ئاوقا؛ دەسەویەخە ☰ گلاویز

**چنگاوش / çingawiş/**: ناو. چنگاوەش؛ چنگەپرچێ؛ کار و ڕەوتی بە گژ یەکدا چوون ☰ گلاویز

**چنگاوڵ / çingawił/**: ناو. پووکاوڵ؛ چەمبۆڵە ☰ ام؛ حالت پنجه‌ی باز به سوی صورت کسی گرفتن، به نشانه‌ی تنفر

**چنگاوەش / çingaweş/**: ☜ **چنگاوش**

**چنگزین** / çing(i)zîn/: چاوگ. ماتە دان؛ خۆ مـات کردن ≡ کز کردن

**چنگسـوتەکە** / çingsûteke/: نـاو. چەنسـووتەکە؛ چێشتی شلە ساوار ≡ آش بلغور

**چنگلەئاسـا** / çing(i)le'asa/: ئاوەڵـناو. قـــرژ؛ لێک‌بلاوی سەرچەماو ≡ چنگک مانند

**چنگڵ** / çingił/: ناو. ١. هەنگڵ؛ بەخەڵ ٢. خیـز و بەردی بنی چالاو ≡ ١. بغل ٢. شـن و ریـگ کـف چاه

**چنگڵە** / çing(i)łe/: ناو. زەنبیلە؛ تریان لـە شـوول یان لە جەگەن ≡ زنبیل

**چنگڵـەچزێ** / çing(i)łeç(i)zê/: نـاو. چۆنیـــەتی چەوسانەوە؛ چرووسانەوە ≡ رنج و مرارت

**چنگڵەسـەرە** / çing(i)łesere/: ئاوەڵـناو. [پـلار] چنگنەسەر؛ قژن؛ قژنەسەرە؛ سەر تەپڵەگوێنی ≡ ژولیده

**چنگن** / çingin/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی جانـەوەری چنگ و پەلدار ≡ دارای چنگال

**چنگنـە** / çing(i)ne/: نـاو. ١. چیگنـــە؛ مـــچ؛ زیندەوەرێکـە بـە پێسـتەوە دەنووسـێ و خـوێن دەمژێ ٢. گیایەکـە ≡ ١. گـاوک؛ نـوعی کنـە ٢. گیاهی است

**چنگنەسەر** / çing(i)neser/: ☜ **چنگڵەسەرە**

**چنگنی** / çing(i)nî/: ناو. هەڵەپەزە؛ پەسپەسەکۆڵە ≡ رُطیل

**چنگورک** / çinguřk/: ☜ **چرنوک**

**چنگۆڵـە** / çingołe/: نـاو. دەسـتووی کووپـە و گۆزەڵە ≡ دستەی خُم و کوزە

**چنگوڕ** / çingûř/: نـاو. چنـگ؛ چنگـاڵ «لـە نـازی چاوی مەستی حالی دڵ سابێنە بـیر تـاهیر/ چلۆنـە؟ کۆترێکە زامزەدەی چنگووڕی شابازێ «سـەید تـاهیر هاشمی»» ≡ چنگال

**چنگە**[1] / çinge/: ناو. هـەنگڵ؛ دەسـکەی کووپـە و گۆزە ≡ دستەی خُم و کوزە

**چنگە**[2]: ئاوەڵناو. لێهاتوو؛ ئازا لە کار ≡ کارآمد

**چنگە**[3]: ئاوەڵکار. لاوێـچ؛ پـڕی مشـتێ ≡ پُـر کـف دست

**چنگەپرچـە** / çingepirçe/: نـاو. چنگـــەپرچێ؛ چنگەپۆپان؛ چەنگەپرچـە؛ شـەڕەژن. هـەروەها: **چنگەپرچە کردن** ≡ نزاع زنانە

**چنگەپرچێ** / çingepirçê/: ☜ **چنگەپرچە**

**چنگەپرماسـکێ** / çingepiřmaskê/: ☜ **چنگەپڵماسکێ**

**چنگەپشیلە** / çingep(i)şîle/: ☜ **پێ‌پشیلە**

**چنگەپڵماسـکێ** / çingepiłmaskê/: نـاو. چنگەپڕماسـکێ؛ چنگەپەڵماسـێ؛ چنگـەفلیقێ؛ کاری دەستبازی و یەکتر تلاندنەوە ≡ دست‌بـازی و غلتاندن یکدیگر

**چنگەپڵماسێ** / çingepiłmasê/: نـاو. شـەڕەچنگ؛ کاری هاشاوڵ بردن بـە پەنجـە و چنـگ گـرتن؛ حاڵەتی کەسێ کە لە شەڕدا وە ژێر کەوتووە و لە ژێرەوە بە چنگ دەست دەکاتەوە ≡ دفاع با چنگ و دندان

**چنگەپۆپان** / çingepopan/: ☜ **چنگەپرچە**

**چنگەپـەڵماسـێ** / çingepełmasê/: ☜ **چنگەپڵماسکێ**

**چنگەچنگ** / çingeçing/: دەنگەناو. دەنگـەدەنگ و زرمە و خرمەی خشڵی زێـڕ و زێـو ≡ جرینـگ و ورینگ

**چنگەڕن** / çingeřin/: ☜ **چنگەڕنێ**

**چنگەڕنێ** / çingeř(i)nê/: ناو. چنگەڕن: ١. کـاری پەنجە و نینۆک لـە زەوی گـیر کـردن بـۆ سـەر کـەوتن لـە جێگـەی لێـژ و ڕژد ٢. دەسـکەنە؛ دروێنەی بە دەست ≡ ١. عمـل چهـارچنگول بـالا رفتن ٢. درو با دستِ خالی

**چنگەفلیقێ** / çingef(i)lîqê/: نـاو. ١. کـار و ڕەوتی

فلیقاندنەوەی میوە و شتی ئاودار بە دەست ٢. ☜ چنگەپلماسکێ ☰ ١. عمل لە کردن میوە و چیزهای آبدار با دست ٢. ☜ چنگەپلماسکێ

**چنگەکڕکێ / çingekiřkê/**: ☜ چنگەکڕێ

**چنگەکڕە / çingek(i)ře/**: ☜ چنگەکڕێ

**چنگەکڕێ / çingek(i)řê/**: ناو. چنگەکڕکێ؛ چنگەکڕە: ١. کاری پەنجە و نینۆک لە زەوی گیر کردن بۆ سەر کەوتن لە جێگەی لێژ و ڕژد ٢. کاری بە نینۆک کڕاندن بۆ هەڵپڕیواندن. هەروەها: **چنگەکڕێ کردن** ☰ ١. عمل چهارچنگول بالا رفتن ٢. عمل با ناخن چیزی را کندن

**چنگەڵە / çingeļe/**: ☜ چوڕەپۆپنەکێ

**چنگەمریشکە / çingem(i)rîşke/**: ناو. پێ‌مریشکە؛ گیایەکە ☰ گیاهی است

**چنگەنە / çingene/**: ناو. کژنگ؛ مێرووی بە پێستەوە نووساو ☰ حشرەی چسبیدە بر پوست

**چنگیر / çingîr/**: ناو. نینۆک؛ ناخون؛ چکیڕ؛ چقیڕ ☰ ناخن

**چنۆک / ç(i)nok/**: ئاوەڵناو. ١. چاونەزێر؛ تەماکار ٢. چاوچنۆک؛ بەئێرەیی. هەروەها: **چنۆکی** ☰ ١. آزمند ٢. حسود

**چنو / ç(i)nû/**: ئاوەڵناو. ئاوها؛ وەها؛ ئاوا ☰ چنان

**چنور / ç(i)nûr/**: ناو. گیایەکی بۆنخۆشە گەڵای لە شویت دەکا ☰ گیاهی خوشبو

**چنوک / ç(i)nûk/**: ئاوەڵناو. قرنیس؛ ڕژد ☰ خسیس

**چنویک / ç(i)nûyk/**: ئاوەڵناو. چنۆک؛ چکووس؛ ڕژد ☰ خسیس

**. چنە / -ç(i)ne/**: پاشەوشە. ١. تەنەر ‹گۆرەویچنە› ٢. بە لێهاتوویی چنینەوە ‹هەنگەچنە› ☰ ١. ـ باف ٢. ـ چین

**چنەچن / ç(i)neçin/**: ناو. زۆربێژی؛ چەنەبازی ☰ وراجی

**چنەر / ç(i)ner/**: ☜ چەوەندەر

**چنەو / ç(i)new/**: ئاوەڵناو. ئاوەها؛ بەمجۆرە ☰ این‌چنین

**چنەوا / ç(i)newa/**: ☜ چەناگە

**چنەوە / ç(i)newe/**: ☜ چەناگە

**چنیاگ / çinyag/**: ☜ چناو

**چنیان / çinyan/**: ☜ چنران

**چنیاو / çinyaw/**: ☜ چناو

**چنیای / çinyay/**: چاوگ. چنران ☰ بافتە شدن

**چنیک / ç(i)nîk/**: ناو. ١. کاری گوڵ چنین بە دروومان ٢. وردکەنان؛ وردەنان؛ ڕێزەنان ☰ ١. گُلدوزی ٢. ریزەی نان

**چنین / ç(i)nîn/**: چاوگ. تێپەڕ. //چنیت؛ دەچنی؛ بچنە// چنتەی؛ چنیەی: ١. تەنین ‹تارای بۆ نارد لە مێلاقە/ بۆی چنیوە کەوای تاقە «هێمن»› ٢. دروێنە کردن ‹هەوارە هەی هەوارە، ئەرێ ساز بن بچینە هەواری/ گوڵان بچنین لە بناران، بیدەین بە یەک بە دیاری «سوارە»› ٣. ڕنینی بەری دار ٤. بژار کردن ٥. لە سەر یەک دانان ☰ ١. بافتن ٢. درو کردن ٣. چیدن میوەی درخت ٤. وجین کردن ٥. روی هم گذاشتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەچنین

**چنینەوە / ç(i)nînewe/**: چاوگ. تێپەڕ. //چنیتەوە؛ دەچنیەوە؛ بچنەوە// ١. دڕاو بە هەودا دروونەوە ٢. دیسانەوە چنین ٣. هەڵگرتنەوەی پرژاو ٤. کۆ کردنەوە ☰ ١. رفو کردن ٢. دوبارە بافتن ٣. جمع کردن ٤. چیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەچنینەوە

**چنیەی / çinyey/**: ☜ چنین

**چو / çu/**: ☜ چوون[٤]

**چوار[١] / ç(i)war/**: ناو. چار؛ یەک و سێ؛ ژمارەی سەرەکی نێوان سێ و پێنج ‹لە پاش سێ نۆرەی چوارە› ☰ چهار

**چوار**[٢]: ئاوەڵناو. چـار؛ دانـێ زیـاتر لـە سـێ دانـە ‹ژمارەی چوار› 💢 چهار

**چوار ـە**[٢]: پێشوشە. خـاوەن چـوار دانـە لـە شـتێ ‹چوارپارچە؛ چوارلا› 💢 چهار-

**چوارئاوێنە / ç(i)war'awêne/**: ☜ **چواراوێنە**

**چواراوێنـە / ç(i)warawêne/**: نـاو. چوارئاوێنـــە؛ چوارایِنە؛ جلکێکی شەڕکەران بووە 💢 چهارآیینـە؛ نوعی لباس جنگجویان قدیم

**چوارایِنە / ç(i)warayne/**: ☜ **چواراوێنە**

**چواربـــاڵ / ç(i)warbał/**: ئاوەڵـــکار. *[مـــەجاز]* خڕمچوون 💢 چهار دست و پا

⊡ **چواربـاڵ کـردن**: *[مـەجاز]* برینـدار کـردنی هـەر دووک قۆڵ بە گوللە 💢 هر دو بازو را به تیر زدن

**چواربەن / ç(i)warben/**: نـاو. ١. کورسـی ٢. ☜ **چوارینە** 💢 ١. صندلی ٢. ☜ **چوارینە**

**چواربەنـدە / ç(i)warbende/**: نـاو. ١. کورسـی ٢. هەر دوو ئانیشک و هەر دوو ئەژنۆ 💢 ١. صندلی ٢. چهاربند

**چوارپا / ç(i)warpa/**: ☜ **چوارپێ**

**چوارپاچکـە / ç(i)warpaçke/**: نـاو. چوارپایـــە؛ کورسی و تەختی لە سـەر نووسـتن 💢 صـندلی و تختخواب

**چوارپارچە**[١] **/ ç(i)warparçe/**: ناو. هەر چوار بەشی کوردستان 💢 چهار بخش کردستان

**چوارپارچە**[٢]: ئاوەڵناو. چوارتیکە؛ چواربەش کـراو 💢 چهارتکه شده

**چوارپارە / ç(i)warpare/**: ناو. چوارتیکـە؛ جـۆرێ گوللەی تفـەنگی سـاچمەیی کـە چـوار ـ پێـنج ساچمەی گەورەی تێدەخەن بۆ نەچیری گەورە 💢 چهارپاره

**چوارپاڵـوو / ç(i)warpałû/**: نـاو. چوارگۆشـەی لـە سەر و ژێر و تەنیشتەوە چوون یەک ‹جا بەو پێیـە دەبـێ ئێسـتە ... داربـەڕووی بنـەتاڵـوو بم! یـەک تەنیشتی چوارپاڵوو بم! «هەژار، چـوار *نامیلکـە*»› 💢 مکعب

**چوارپایە / ç(i)warpaye/**: ☜ **چوارپاچکە**

**چوارپوڵەکـە / ç(i)warpûłeke/**: نــاو. چـــوار قولاغەی کەوش 💢 چهار تکه چـرم مثلثـی کـه بـر کنارەی کفش دوزند

**چوارپەل**[١] **/ ç(i)warpel/**: ناو. *[پلار]* چوار دەسـت و پێ؛ چارلەبک ‹ـ چوارپەلی ئەسـپەکەیی کـێ پـەی کـرد؟/ ـ ئێمـەیی داس بـە دەسـت بـووین، ئێمـە! «گۆران»› 💢 چهار دست و پا

⊡ **چوارپەل قـەوی**: *[پلار]* قەڵەوی پتـەوی ناجسـن ‹تەلاق گەر بێ بەدەمیا ئەو زلەی چوارپـەل قـەوی ... «شێخ ڕەزا»› 💢 تنومند بی‌ریشه

**چوارپەل**[٢]: ئاوەڵکار. بە هەر دوو دەست و دوو پاوە ‹پای خزا و چوارپەل کەوتە نێو قوڕەکـەوە› 💢 چهـار دست و پا

**چوارپینە / ç(i)warpîne/**: ناو. پینـە لـە پەنجـە و پاژنەی کەوش 💢 پینه بر پنجه یا پاشنەی کفش

**چـوارپێ / ç(i)warpê/**: نـاو. چارپـێ؛ چوارپـا: ١. ئاژەڵ؛ زیندەوەری ماڵی ٢. سەگی پاس ٣. *[پلار]* مرۆی شـەڕ و لاسـار 💢 ١. دام و احشـام ٢. سـگ نگهبان ٣. آدم بدرفتار

**چوارتـــاق / ç(i)wartaq/**: نـــاو. بـــــەرهێوان؛ هەیوانەبەرزە 💢 تراس

**چوارتوخمە / ç(i)wartuxme/**: ناو. تێکەڵـێک لـە تۆمگـەلی وەردێنـە، ڕکێشـە و ناوکـە بـەهێ و سیپیسوو، کە دەمکراوەکەی بـۆ سـاڕێژ کـردنی کۆخـە و نـەرم کردنـەوەی سـینگ باشـە 💢 چهارتخم

**چوارتیکە**[١] **/ ç(i)wartîke/**: ☜ **چوارپارە**

**چوارتیکە**[٢]: ☜ **چوارپارچە**[٢]

**چوارجامە / ç(i)warcame/**: ☜ **چوارمەشقان**

**چوارچـابوغ / ç(i)warçabuğ/**: نـاو. چوارچـــاک؛

چوارخشتەک؛ گرۆڵ؛ ئەو چوارپارچەی لە بن هەنگڵی کەوای دەدەن ≡ پارچەی زیر بغل جامه

**چوارچاك** / ç(i)warçak/: ناو. ١. لاداوێنی شاقەڵ ٢. ☜ **چوارچابوغ** ≡ ١. حاشیەی دامن ٢. ☜ **چوارچابوغ**

**چوارچاو**[1] / ç(i)warçaw/: ناو. سەگێ خاڵی ڕەشی لە ژێر چاوە ≡ سگی که زیر چشم لکەی سیاه دارد

**چوارچاو**[2]: ئاوەڵناو. ١. *[مەجاز]* زۆر بە ئاگا لە شت ٢. *[مەجاز]* گێژ و شێواو ٣. *[کینایە]* دووژنە؛ خاوەنی دوو ژن ≡ ١. مُراقب ٢. مات و مبهوت ٣. دو زنه

**چوارچاو**[3]: ئاوەڵکار. چوارچاوە؛ چوارچاوی؛ بە وردی ≡ چهارچشمی

**چوارچاوە** / ç(i)warçawe/: ☜ **چوارچاو**[3]

**چوارچاوی** / ç(i)warçawî/: ☜ **چوارچاو**[3]

**چوارچمک** / ç(i)warçimk/: ناو. چوارگۆشە ≡ مربع

**چوارچمکە** / ç(i)warçimke/: ناو. چوارمەشقان؛ کاری بە پانەوە ڕۆنیشتن ≡ چهارزانو

**چوارچنگۆڵە** / ç(i)warçingołe/: ناو. چوارچنگە؛ چوارچەقڵ؛ چوارچەقەڵ؛ چوارچوقوڵ؛ کووپە و مەنجەڵی چوارهەنگڵ ≡ چهارگوشی؛ خُم یا دیگ چهار دسته

**چوارچنگە** / ç(i)warçinge/: ☜ **چوارچنگۆڵە**

**چوارچوقوڵ** / ç(i)warçuquł/: ☜ **چوارچنگۆڵە**

**چوارچۆ** / ç(i)warço/: ☜ **چوارچێوە**

**چوارچوو** / ç(i)warçû/: ☜ **چوارچێوە**

**چوارچەقڵ** / ç(i)warçeqił/: ☜ **چوارچنگۆڵە**

**چوارچەقەڵ** / ç(i)warçeqeł/: ☜ **چوارچنگۆڵە**

**چوارچێوە** / ç(i)warçêwe/: ناو. چارچێوە؛ چوارچۆ؛ چوارچوو؛ چارچوو: ١. چارچم؛ دۆربەند؛ چوار لاسکی پێکەوە بەسراوی وەک چوارگۆشێکی ناو بۆش کە شتێک لە خۆ دەگرێت ‹چوارچێوەی دەرک و پەنجەرە› ٢. کەوشەن؛ سنوور؛ پەرێز ‹دەبێ لە چوارچێوەی قانووندا تێکۆشین› ٣. دوزەنە؛ مرێس ‹کار دەبێ چوارچێوەی هەبێ› ≡ ١تا٣. چهارچوب

**چوارخاڵ** / ç(i)warxał/: ناو. ١. هەر چوار تەکخاڵی پەڕی قومار ٢. چوارلۆ لە پەڕی قوماردا ٣. دوو خەتی تێکپەڕیو ≡ ١. چهار تکخال ورق ٢. ورق چهارلو ٣. علامت ضربدر

⊡ **چوارخاڵ کێشان**: *[کینایە]* ڕووڕەش کردن و ئابڕوو بردن ≡ رسوا کردن

**چوارخانە** / ç(i)warxane/: ئاوەڵناو. چارخانە؛ شەترەنجی ≡ چهارخانه

**چوارخرت** / ç(i)warxirt/: ناو. بەران، بزن، مەڕ و بۆقلەی چوار ساڵە ≡ گوسفند، بز و بوقلمون چهارساله

**چوارخشتەک** / ç(i)warxiştek/: ☜ **چوارچابوغ**

**چوارخشتەکی** / ç(i)warxiştekî/: ☜ **چوارینە**

**چواردانگ** / ç(i)wardang/: ناو. برنجی نیوەکوتاو ≡ برنج نیم‌کوبیده

**چواردە**[1] / ç(i)warde/: ناو. چاردە؛ سێزدە و یەک ≡ چهارده

**چواردە**[2]: ئاوەڵناو. چاردە؛ یەکێ زیاتر لە سێزدە دانە ≡ چهارده

**چواردەڕێیان** / ç(i)wardeřêyan/: ناو. جادە و شەقامی هەرە پان ≡ شاهراه

**چواردەستان** / ç(i)wardestan/: ئاوەڵکار. چواردەستەکی؛ بە دوو دەست ≡ دو نفره

**چواردەستەکی** / ç(i)wardestekî/: ☜ **چواردەستان**

**چواردەمین** / ç(i)wardemîn/: ئاوەڵناو. چواردەهەم؛ چواردەهەمین؛ بە ڕیز یان پلەی چاردەهەمەوە ≡ چهاردهم

**چواردەور** / ç(i)wardewr/: ناو. دەوراندەور؛ کادر؛ دۆرمادار؛ دەورانپشت ≡ گرداگرد

**چواردەهەم** / ç(i)wardehem/: ئاوەڵناو. چواردەمین

☪ چهاردهم

**چوارده‌هه‌مین** / ç(i)wardehmîn/: ☜ **چوارده‌مین**

**چواردیـواری** / ç(i)wardîwarî/: نـاو. ۱. شــوێنی ده‌ورگیراو ‹چواردیوارییه‌کی پێویست بوو که به شه‌و ڕانه‌که‌ی تێدا مۆڵ بدا› ۲. *[مه‌جاز]* جێگـای پـاوان؛ قـۆرخ ‹بـابم لـه نێـو چواردیـواری ماڵـه‌وه ئـازادی هێشـتبووین› ۳. *[کینایـه]* مـاڵ؛ خـانوو؛ یانــه ‹چواردیـواری خۆمــه و ڕای بــه خۆمــه› ☪ ۱تـا۳. چهاردیواری

**چوارڕا** / ç(i)warřa/: ☜ **چوارڕێیان**

**چوارڕێ** / ç(i)warřê/: ☜ **چوارڕێیان**

**چوارڕێگان** / ç(i)warřêgan/: ☜ **چوارڕێیان**

**چوارڕێیـان** / ç(i)warřêyan/: نـاو. چارڕێک؛ چوارڕا؛ چـوارڕێ؛ چوارڕێگـان؛ جه‌مســه‌ری دوو ڕێگــه‌ی تێک‌په‌ڕیو ☪ چهارراه

**چـوارزه‌رب** / ç(i)warzerb/: نـاو. لــه کێشــه‌کانی مووسیقا که به شێوه‌ی چـوار ڕه‌ش ده‌نووسـرێت ☪ چهارضرب

**چوارسروشت** / ç(i)wars(i)ruşt/: ناو. چـوار مـاکی سه‌ره‌کی (ئاو، خاک، ئاگر و با) ☪ چهار عنصر (آب، خاک، آتش و باد)

**چوارسۆ** / ç(i)warso/: ☜ **چوارسو**

**چوارســو** / ç(i)warsû/: نــاو. چوارســـۆ: ۱. چوارگـوزه‌ر؛ ڕاسـته‌بازار ۲. چوارسـووچ؛ چـوارلا؛ جۆرێ پێچ‌کوشـتی ☪ چهارسو: ۱. راسته‌بـازار ۲. پیچ‌گوشتی چهارسو

**چوارســووچ** / ç(i)warsûç/: نــاو. ۱. چوارگۆشــــه؛ چوارقولینچک؛ چـوارلا ۲. ☜ **چوارسو-۲** ☪ ۱. چهارگوشه ۲. ☜ **چوارسو-۲**

**چوارسه‌د**[1] / ç(i)warsed/: ناو. ژمـاره‌ی سـه‌ره‌کی نێوان سێسه‌د و نه‌وه‌د و نۆ و چوارسـه‌د و یـه‌ک؛ چوار به‌رانبه‌ری سه‌د ☪ چهارصد

**چوارسه‌د**[2]: ئاوه‌ڵناو. دانه‌یـه‌ک زیـاتر لـه سێسـه‌د و نه‌ود و نۆ دانه ☪ چهارصد

**چوارسه‌دم** / ç(i)warsedim/: ☜ **چوارسه‌ده‌م**

**چوارسه‌دمی**/ ç(i)warsed(i)mî/: ☜ **چوارسه‌ده‌می**

**چوارسـه‌ده‌م** / ç(i)warsedem/: ئاوه‌ڵناو. چوارسه‌دم؛ به ڕیزمـان یـان پلـه و جێگـای چوارسـه‌ده‌وه ☪ چهارصدم

**چوارســــه‌ده‌می** / ç(i)warsedemî/: جێنـــــاو. چوارسه‌دمی؛ ئه‌وه‌ی لـه ڕیـز، پلـه یـان جێگـای چوارسه‌ده‌مدایه ☪ چهارصدمی

**چوارسـه‌ده‌مین** / ç(i)warsedemîn/: ئاوه‌ڵـناو. بــه ڕیزمــان یــان پێگـــه‌ی چوارســــه‌ده‌مه‌وه ☪ چهارصدمین

**چوارشانه** / ç(i)warşane/: ئاوه‌ڵـناو. بلـه‌ر؛ خـاوه‌ن شانی پان و سنگی ئه‌ستوور و پته‌و ☪ چهارشانه

**چوارشه‌م** / ç(i)warşem/: ☜ **چوارشه‌ممه**

**چوارشه‌مبۆ** / ç(i)warşembo/: ☜ **چوارشه‌ممه**

**چوارشه‌مبی** / ç(i)warşembî/: ☜ **چوارشه‌ممه**

**چوارشـه‌ممه** / ç(i)warşemme/: نـاو. چوارشـــه‌م؛ چوارشه‌مبۆ؛ چوارشه‌مبی؛ چوارشه‌مه؛ چوارشه‌مۆ؛ چارشـه‌م؛ چارشـه‌مب؛ چارشـه‌مبۆ؛ چارشـه‌مبی؛ چارشـه‌مۆ؛ نـاوی ڕۆژی پێنجـه‌م لـه حـه‌وتووی ئێرانیدا، نێـوان سـێ‌شـه‌ممه و پێـنج‌شـه‌ممه ☪ چهارشنبه

**چوارشه‌ممه‌ســـــوری** / ç(i)warşemmesûrî/: ☜ **چوارشه‌مه‌سوری**

**چوارشه‌مۆ** / ç(i)warşemo/: ☜ **چوارشه‌ممه**

**چوارشه‌مه** / ç(i)warşeme/: ☜ **چوارشه‌ممه**

**چوارشه‌مه‌ســـــوری** / ç(i)warşemesûrî/: نـــــاو. چوارشه‌ممه‌سـووری؛ چوارشــه‌ممه کولــه؛ کولــه چوارشه‌مۆ؛ قوڵه چوارشــه‌مه؛ چوارشــه‌ممه کلــه؛ ئـاخرین شه‌وچوارشـه‌مبه‌ی سالـی هـه‌تاوی کـه ئێرانییه‌کان سه‌ر له ئێوارارانی، به ڕێ‌و ڕه‌سمێکی تایبه‌ت، وه‌ک هه‌ڵکردنی ئاور و بازدان به سه‌ریدا،

دەیکەنە جێژن ☜ چهارشنبەسوری

**چوارقاپ** / ç(i)warqap/: ناو. جۆرێک یارییە بە میچ ☜ بازی چهارقاب

**چوارقوڕنە** / ç(i)warquřne/: ناو. ١. چوار گۆشەی ماڵ ٢. هەر چوار پارچە بەژی دنیا ☜ ١. چهار گوشەی منزل ٢. چهار خشکی بزرگ جهان

**چوارقولینچک** / ç(i)warqulînçik/: ☜ **چوارسوچ**

**چوارقەد** / ç(i)warqed/: ئاوەڵناو. چوارلا؛ دوو جار نووشتاوە ☜ چهارلا؛ دوبار تا شده

**چوارقەمچ** / ç(i)warqemç/: ناو. کاری ڕیش و سمێڵ و برۆ تاشین بە ئەتک ☜ نوعی جریمە بە شکل تراشیدن ریش و سبیل و ابرو

**چوارگا** / ç(i)warga/: ناو. یەکێ لە حەوت دەزگای مووسیقای ئێرانی ☜ چهارگاه

**چوارگوڵ** / ç(i)warguł/: ناو. دەرمانێکی گیایی بریتی لە گوڵی وەنەوشە، تۆڵەکە، لەولاو و... کە دەمکراوەکەی ڕەوانە ☜ چهارگُل

**چوارگۆش** / ç(i)wargoş/: ئاوەڵناو. دووجا؛ دووبەر ☜ مُربع

**چوارگۆشە**[1] / ç(i)wargoşe/: ☜ **چوارسوچ**

**چوارگۆشە**[2]: ئاوەڵناو. بە چوار گۆشەوە ‹بەرێ چوارگۆشەم دەوێ› ☜ دارای چهار گوشه

**چوارلا** / ç(i)warla/: ناو. ١. ☜ **چوارقەد** ٢. خۆرهەلات و خۆرنشین و باکوور و باشوور ☜ ١. ☜ **چوارقەد** ٢. چهار جهت اصلی جغرافیایی

**چوارلاچەنگ** / ç(i)warlaçeng/: ناو. یەکەی کات لە نۆت نووسیندا کە دەکاتە یەک هەشتەمی چەنگ ☜ چهارلاچنگ

**چوارلۆ**[1] / ç(i)warlo/: ئاوەڵناو. چوارلا ‹مەلافەی چوارلۆ› ☜ چهارلا

**چوارلۆ**[2]: ئاوەڵکار. چوارقەد ‹پەتووەکە چوارلۆ داخە!› ☜ چهارلا

**چوارلوو** / ç(i)warlû/: ☜ **چالک**

**چوارمشقی** / ç(i)warmişqî/: ☜ **چوارمەشقان**

**چوارمەشقان** / ç(i)warmeşqan/: ناو. چوارمشقی؛ چوارمەشقی؛ چوارمەشقە؛ چارمەشقە؛ چارتیکانێ؛ چارمێرکی؛ چوارجامە؛ چوارمیلکە؛ چوارمێلکە؛ چوارمێردەکی؛ چوارچمک؛ مێهڤانیک؛ باری پانەوەپان ڕۆنیشتن ☜ چهارزانو

⊡ **چوارمەشقان دانیشتن**: چوارمەشقی دان؛ پا جەم کردن و دانیشتن ☜ چهارزانو نشستن

**چوارمەشقە** / ç(i)warmeşqe/: ☜ **چوارمەشقان**

**چوارمەشقی** / ç(i)warmeşqî/: ☜ **چوارمەشقان**

⊡ **چوارمەشقی دان**: ☜ **چوارمەشقان دانیشتن**

**چوارمیخە** / ç(i)warmîxe/: ☜ **چوارمێخە**

**چوارمیلکە** / ç(i)warmîlke/: ☜ **چوارمەشقان**

**چوارمێخە**[1] / ç(i)warmêxe/: ناو. ئەشکێل؛ ئشکێل؛ چوارمیخە؛ چوارنیخە؛ خاچ ☜ چهارمیخه

⊡ **چوارمێخە کردن**: ☜ **لە چوارمێخە دان**

**چوارمێخە کێشان**: ☜ **لە چوارمێخە دان**

**لە چوارمێخە دان**: چوارمێخە کردن؛ چوارمێخە کێشان؛ چوارنیخە کێشان؛ لە خاچ دان؛ چوارپەل داکوتان و شەتەک دان بە مەبەستی کوشتنی پێڕای ئەشکەنجە و ئازارێکی زۆر ☜ بە چارمیخ کشیدن

**چوارمێخە**[2]: ئاوەڵناو. چوارمیخە؛ چوارنیخە؛ هەر چوار پەل بەسراو ☜ چهارمیخه

**چوارمێخە**[3]: ئاوەڵکار. چوارمیخە؛ چوارنیخە؛ سفتوسۆڵ ☜ چهارمیخه

**چوارمێردەکی**/ ç(i)warmêrdekî/: ☜ **چوارمەشقان**

**چوارمێلکە** / ç(i)warmêlke/: ☜ **چوارمەشقان**

**چوارناڵ**[1] / ç(i)warnał/: ناو. چوارناڵە؛ چوارناڵی؛ چارگاف؛ چارگاڤی؛ غار؛ پرتاف؛ پرتاو؛ ترەختان؛ تەڕات؛ چوارە؛ لنگ‌کوت؛ خێراترین ڕۆیشتنی

ئەسپ ☰ چهارنعل

**چوارناڵ**[٢]: ئاوەڵکار. چوارناڵە؛ چوارناڵی؛ چارگاف؛ چارگافی؛ ڕۆیشتنی زۆر بە خێرا ☰ چهارنعل

**چوارناڵە / ç(i)warnałe/:** ☜ **چوارناڵ**

**چوارناڵی / ç(i)warnałî/:** ☜ **چوارناڵ**

**چوارنوختە / ç(i)warnuxte/:** ناو. چوارخاڵ ☰ چهارنقطه

**چوارنیخە / ç(i)warnîxe/:** ☜ **چوارمێخە**

**چواروەرز / ç(i)warwerz/:** ناو. چارکەوت؛ چاردەساڵ ☰ چهار فصل

**چوارە / ç(i)ware/:** ☜ **چوارناڵ**[١]

**چوارهەنگڵ**[١] **/ ç(i)warhengił/:** ناو. چوارهەنگوڵ؛ کووپە و مەنجەڵی چوار دەسک ☰ خُم و دیگ چهاردسته

**چوارهەنگڵ**[٢]: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* پان و پۆڕ ☰ لندهور

**چوارهەنگوڵ / ç(i)warhenguł/:** ☜ **چوارهەنگڵ**

**چوارینە / ç(i)warîne/:** ناو. چارین؛ چارینە؛ چوارێنە؛ چارینی؛ چواربەن؛ چوارخشتەکی؛ شیعری چوار لەتی سێ پاشڵ کە لە سەر کێشی (لا حَولَ وَ لا قوَّةَ إلا بالله) بێت ☰ رُباعی

**چواریەک / ç(i)waryek/:** ناو. چارەک؛ لە چوار پاژ پاژێک ☰ یک‌چهارم

**چواریەکی / ç(i)waryekî/:** ئاوەڵناو. بەشێک لە چوار بەشی داهاتی زەوی ☰ یک‌چهارم محصول

**چوارێنە / ç(i)warêne/:** ☜ **چوارینە**

**چوالوو / ç(i)walû/:** ☜ **چالگ**

**چوالە / ç(i)wale/:** ناو. ١. دانگوو؛ بادامەتاڵەی خۆش‌کراو ٢. چەقالە؛ بادام و قەیسی فەریک ☰ ١. بادام‌تلخ شیرین شده ٢. چغاله

**چوالەبادام / ç(i)walebadam/:** ناو. دەنکە بادامی سوێرکراو ☰ چغاله‌بادام نمکسود

**چوالەتاڵە / ç(i)waletałe/:** ناو. بادامەتاڵە ☰ بادام‌تلخ

**چوان / ç(i)wan/:** چاوگ. تێنەپەڕ. //چوای؛ دەچوێی؛ بچوێ// نەمان؛ بە سەر چوون ☰ بە سر آمدن؛ شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: چواو/ چاوگی نەرێنی: نەچوان

**چواندن / ç(i)wandin/:** چاوگ. ١. پووچەڵ کردنی گۆرەوێ لە جۆرابێندا ٢. قت کردن لە یاریدا ٣. شوبهاندن ‹خۆ چواندن بە ئاژەڵ› ٤. فەوتاندن؛ بوونە هۆی بە سەر چوون ‹چواندن و نەکردنی نوێژ لە ئیسلامدا گوناحە› ☰ ١. پوچ کردن جوراب در جوراب‌بازی ٢. خارج کردن از بازی ٣. تشبیه کردن ۴. قضا انداختن

**چوانگە / ç(i)wange/:** ناو. بانک؛ بانق ☰ بانک

**چواو / ç(i)waw/:** ئاوەڵناو. نەماو؛ فەوتاو؛ لە بەین چوو ☰ از میان رفته

⊡ **چواوچوان:** فەوتانی وەخت و کاتی نوێژ ☰ از وقت نماز گذشتن

**چوپ / çup/:** ناو. زەوت؛ داگیر؛ کاری بە زۆر ساندن ☰ غصب

⊡ **چوپ کردن:** زەوت کردن؛ داگیر کردن؛ بە زۆر ساندن ☰ غصب کردن

**چوپوو / çupû/:** ناو. شوان؛ شڤان ☰ چوپان

**چوترم / çutirm/:** ناو. وچان؛ پشوو ☰ استراحت کوتاه

**چوتورمە / çuturme/:** ناو. پشێوی؛ ئاژاوە ☰ آشوب

**چوتیر / çutîr/:** ☜ **چوێشتیر**

**چوچ / çuç/:** ☜ **چوور-١**

**چوچک / çuçik/:** ناو. ١. ئەسکوو؛ ئەسکوێ؛ کەوچکی گەورەی کلکدرێژ ٢. کەوچکی لە دار ٣. داری دوولقی دروو کۆ کردنەوە ٤. بەچکە مریشک؛ جووچکە مامر ٥. ☜ **چۆلەکە** ☰ ١. چمچە ٢. قاشق چوبی ٣. چوب دوشاخە برای جمع‌آوری خار ۴. جوجەی مرغ ۵. ☜ **چۆلەکە**

**چوچله / çuçle/**: ناو. چوچول؛ میتکە؛ بەلۆکە؛ قیتکە؛ خەمشە؛ چیچک ☰ چوچوله

**چوچول / çuçul/**: ☜ چوچله

**چوحەلین / çoĥelîn/**: ☜ چۆحەلین

**چوخت / çuxt/**: ناو. مووی تووکەبەر؛ مووی بەرگەدە ☰ موی زهار

**چوختی / çuxtî/**: ناوەلناو. ۱. مەزبووت؛ زرت و زیندو؛ لەکارهاتوو ۲. چەختی؛ بێشەرمی ☰ ۱. چُست و چالاک ۲. بی‌شرمی

**چوخساندن / çuxsandin/**: چاوگ. ۱. ئەنگاوتنی مەرمەڕ لە مێشێندا بە جۆرێ کە هاوێژراو لە شوێن مەرمەڕی داکراودا ڕاوەستێ ۲. *[کنایە]* دەرکردن و جێگە گرتنەوە ☰ ۱. زدن تیله با تیله‌ی رقیب و جا گرفتن آن در تیله‌بازی ۲. بیرون کردن و جایگیر شُدن

**چوخم / çuxm/**: ناو. چوخمە: ۱. ژووری سەر ڕێڕەوی کووچە ‹سەرم ئەبێ بە چوخمی سەر شەقام «شێرکۆ»› ۲. کووچە و کۆلانی تەنگەبەر ☰ ۱. اطاق بالای کوچه ۲. کوچه‌ی تنگ

**چوخماخ / çuxmax/**: ناو. گۆپاڵ؛ توخماخ ☰ چُماق

**چوخمە / çuxme/**: ☜ چوخم

**چوخور[1] / çuxur/**: ناو. چوغر؛ چغر؛ مێشەلانی پڕ ☰ بیشه و نیزار انبوه

**چوخور[2]**: ناوەلناو. شووفار و شەیتان ☰ سخن‌چین

**چوخور[3]**: پێرۆ. ← چەموچوخور

**چودەن / çuden/**: ناو. ئالیاژی ئاسن و ۲ تا ٤ لە سەدی کەربون ☰ چُدن

**چورت / çurt/**: ناو. ۱. زرت؛ شیر؛ ترێ بە لێو بۆ گاڵتە پێ کردن ۲. ☜ چۆرت[1]ـ۲ ☰ ۱. شیشکی ۲. ☜ چۆرت[1]ـ۲

**چورتان / çurtan/**: ☜ چرتان

**چورتاندن / çurtandin/**: ☜ چرتاندن

**چورتانن / çurtanin/**: ☜ چرتاندن

**چورتە / çurte/**: ☜ چرتە

**چورج / çurç/**: ناو. ترس؛ سام ☰ ترس

**چورخ / çurx/**: ناو. چەرخی چەقۆ تیژ کردن ☰ چرخ چاقوتیزکنی

**چورۆ / çuro/**: ناو. چەرەسی ترووکاندنی؛ ئەو شتانەی لە بەر میوان دادەنرێن و دەترووکێن ☰ آجیل

**چوریسک / çurîsk/**: ناو. ۱. پزیسک؛ ئاورینگ؛ پریشکی پچووکی ئاگر یان ئاسنی سوورەوەبوو ۲. تروسکەی کەم لە دوورەوە ☰ ۱. شراره ۲. سوسو

**چوریلگ / çurîlig/**: ناو. گیایەکی خۆڕسکە ☰ گیاهی است

**چوڕ / çuř/**: ناو. ۱. سپیایی زۆر سپی ‹بەفر تویژاڵی بەستووە، وێنەی چوڕی شیر› ۲. قەرقاوڵ ☰ ۱. سفیدی یکدست ۲. قرقاول

**چوڕ ـ چوڕ / çuř çuř/**: دەنگ. دەنگی ڕژانی ئاو لە بڵندییەوە ☰ شُر ـ شُر آب

**چوڕڕە / çuřře/**: ☜ چوڕە

**چوڕنوسقاو / çuřnusqaw/**: ناو. زەردایی چەوری سەر ئاوی گەرم ☰ قشر نازک چربی بر آب گرم

**چوڕە / çuře/**: ناو. چوڕڕە؛ جڕە؛ جککە؛ جککەبۆرە؛ جورەکلاونە؛ قازلاخ؛ قازەلاخ؛ تیرەیەک مەلی کێوی، لە پاساری گەورەتر، دەنگخۆشن، پەڕ و پۆیان قاوەیی ڕێ ـ ڕێیە، بە گەل دەژین و هەڵفڕینیان دەگمەنە، دانەوێڵە و کرم و مێروو دەخۆن و پتر لە شازدە جۆریان هەیە ☰ چکاوک

**چوڕەپۆپنە / çuřepopne/**: ☜ چوڕەپۆپنەکی

**چوڕەپۆپنەکی / çuřepopnekî/**: ناو. چوڕەپۆپنە؛ چورەکلاونە؛ چۆڕەپۆپنەکی؛ پیزپیزاک؛ چنگەڵە؛ سووریلی؛ سریلە؛ سۆفیلکە؛ سەفەقیتە؛ سەربەکلاوە؛ فشەکلاونە؛ کوڕکلاو؛ کلاوکوڕە؛

کلاونە؛ باڵندەیەکە لە تیرەی چوڕە ⚏ چکاوک کاکُلی

**چوڕەقازەلاخ / çuřeqazełax/**: ناو. چوڕەگەڵوازە ⚏ چکاوک گندُمزار

**چوڕەکلاونە / çuřek(i)ławne/**: ☜ **چوڕەپۆپنەکی**

**چوڕەگەڵوازە / çuřegełwaze/**: ☜ **چوڕەقازەلاخ**

**چوڕیک / çuřîk/**: ☜ **چکوس**

**چوڕیۆڕ / çuřyoř/**: ناو. قەرقاوڵ؛ کەڵەبابی دارستان ⚏ قرقاول

**چوز / çuz/**: ناو. متوربە؛ پەیوەند ⚏ پیوند درختی

**چوزە / çuze/**: ناو. ١. خونچە؛ غونچە؛ گوڵووک ٢. لاسکی ناسکی تازە سەردەرهاتووی گیای وەک ڕێواس و کەنگەر ‹چوزەئەسپنگ؛ چوزەکەنگەر› ⚏ ١. غُنچە ٢. جوانەی برخی گیاهان

**چوزین / çuzîn/**: ناو. گیایەکی بۆنخۆشە ⚏ گیاهی خوشبو

**چوست / çust/**: ناوەڵناو. مەزبوت؛ خێرا؛ بەکار ⚏ چُست

**چوستی / çustî/**: ناو. خێرایی؛ چالاکی؛ مەزبووتی ⚏ چُستی

**چوسگورگ / çusgurg/**: ناو. پیرایشۆکە؛ پیرۆشک ⚏ خرخاکی

**چوسلە / çusle/**: ناو. تەرس؛ پیسایی یەکسم ⚏ پهِن

**چوشتر / çuştir/**: ☜ **چوێشتیر**

**چوشتیر / çuştîr/**: ☜ **چوێشتیر**

**چوغلی / çuğlî/**: ناو. جیقنە؛ ڕیقنە؛ ڕێقنە ⚏ چَلغوز؛ فضلەی پرندگان

**چوغڵی / çuğłî/**: ناو. دەغەڵی؛ گزیکاری؛ داوبازی ⚏ دَغَلی

**چوغور / çuğur/**: ☜ **چغر**

**چوغورد / çuğurd/**: ☜ **چغر**

**چوقڵ / çuqł/**: ناو. دڕک؛ دڕی ⚏ خار

**چوقڵی / çuqłî/**: ناو. سەرچڵ؛ سەرلک؛ خونچەی سەر لک و پۆپی دار ‹بۆنخۆشیی وەنەوشە و گوڵی ئاڵ/ پشکۆبوو لە چوقڵی سەوڵ و شمشاڵ «هەژار، *مەموزین*»› ⚏ غنچە و ساقەی بالای درخت

**چوکار / çukar/**: ناو. نۆکەر؛ خزمەتکار؛ خولام ⚏ چاکر

**چوکڵە / çukłe/**: ناو. چکڵە: ١. چیلکەدار؛ پارچەداری باریک و وردیلە ٢. سووچ و قوژبن؛ گۆشە ٣. ددانەی پیت ٤. پشکی مەشکە و پێستە ⚏ ١. چلیکە ٢. گوشە ٣. دندانەی حروف ۴. دریوش چوبی مشک

**چوکڵەچزێ / çukłeç(i)zê/**: ناو. *[کینایە]* چکڵەچزێ؛ ئازار و ئێشی زۆر ⚏ درد و رنج فراوان

**چوکڵەختێ / çukłex(i)tê/**: ناو. ١. کاری چوکڵە کردنە ناو شتێکدا بۆ درووخاندن یان دەرکردنی شتێک ٢. *[کینایە]* کاری هان/ دنە دان. هەروەها: **چوکڵەختێ دان** ⚏ ١. عمل چوب در سوراخ کردن ٢. تحریک

**چوکڵەشکێن / çukłeş(i)kên/**: ناوەڵناو. *[کینایە]* نێوانتێکدەر؛ شەیتانیکەر لە نێوان خەڵکدا ⚏ دو بهم زن

**چوکڵەشکێنی / çukłeş(i)kênî/**: ناو. *[کینایە]* کاری نێوان تێکدان. هەروەها: **چوکڵەشکێنی کردن** ⚏ دو بهمزنی

**چوکڵەشەمچە / çukłeşemçe/**: ناو. زلووک؛ زلووکە؛ دەنکەشەمچە ⚏ چوب کبریت

**چوکڵەعنە / çukłe'ne/**: ☜ **چوکڵەقنگە**

**چوکڵەقنگە / çukłeqinge/**: ناو. چوکڵەعنە؛ پووشبەقنگە؛ پووشبەقوونە؛ زەلەقوون؛ دومدیک ⚏ سنجاقک

**چوکڵەقولاپ / çukłequlap/**: ناو. داری قولاپی ماسیگر ⚏ چوب ماهیگیری

**چوکڵەنەوات / çukłenewat/**: ناو. مژمژە؛

چوکلەقنگە ≡ آب‌نبات چوبی

⊡ **چوکلە تێ خستن:** ☜ **چیلکە لە پیسایی وەردان**

**چولە** / çule/: ناو. ژیشک؛ ژووژک؛ ژووژوو؛ ژووژی ≡ جوجه‌تیغی

**چوڵوسک** / çułusk/: ناو. بزووت؛ سەلکەبزووت ≡ نیمسوز

**چومک** / çum(i)k/: ☜ **چۆلەکە**

**چون** / çun/: ☜ **چوون**[٣و۴]

**چونا** / çuna/: ناو. گونک؛ ئەنگوتکەهەویر؛ گوتکەهەویر ≡ چونه‌ی خمیر

**چونچە** / çunçe/: ناو. مەنجەڵی چکۆلە ≡ دیگ کوچک

**چونکاتێ** / çunkatê/: ☜ **چونکوو**

**چونکوو** / çunkû/: ئاوەڵکار. چونکە؛ چونکی؛ چون؛ چونکاتێ؛ چوونکوو ‹دڵم مەشکێنە چونکوو مەخزەنی دەرد و خەمی تۆیە/ فیدای شەرت و وەفات بم، چی بە سەر هات مەیلی جارانت؟ «مەستوورە»› ≡ زیرا؛ چونکه

**چونکە** / çunke/: ☜ **چونکوو**

**چونکی** / çunkî/: ☜ **چونکوو**

**چونگ** / çung/: ناو. جونگ؛ گیایەکی گوڵزەردی بۆنخۆشە ≡ گیاهی خوشبو

**چونگە** / çunge/: ناو. چینە ≡ چینه

**چونیەک** / çunyek/: ئاوەڵناو. وەکیەک ≡ یکسان

**چونیەکی** / çunyekî/: ناو. نۆلانی؛ چۆنیەتی لێک چوون ≡ شباهت

**چوی** / ç(i)wî/: ناو. چای؛ چا ≡ چای

**چویت** / çuyt/: ناو. خم؛ هەش ≡ نیل

**چویتلی** / çuytlî/: ئاوەڵناو. هەش‌لێدراو؛ دە خم نراو ‹بێ‌قیمەتە لای ئێمە، یەقین بەرگی چویتلی/ عاشق بە هونەر، مەستی غەزەب، تێغی دەبانین «قانع»› ≡ نیلگون

**چویتی** / ç(i)wîtî/: ناو. نیلی؛ کەوە؛ کەوێ؛ شین‌تۆخ ≡ نیلی

**چویچ** / çuyç/: ☜ **چۆلەکە**

**چویر** / çuyr/: ناو. گیایەکی کێوییە وەک ڕازیانە لە ناو بەفردا دەڕوێ و بۆنێکی خۆشی هەیە ≡ گیاهی است

**چویرە** / çuyre/: ناو. هاوار و زیقە ≡ جیغ‌وداد

**چویز** / çuyz/: ئاوەڵناو. دۆڕاو ≡ بازنده؛ باخته

**چویشتیر** / ç(i)wîştîr/: ☜ **چوێشتیر**

**چویک** / çuyk/: ☜ **چۆلەکە**

**چوین**[١] / çuyn/: ☜ **چوون**[١]

**چوین**[٢]: ئاوەڵکار. چۆن؛ چلۆن ≡ چگونه

**چوێ** / ç(i)wê/: ناو. برین؛ زام ≡ زخم

**چوێدار** / ç(i)wêdar/: ئاوەڵناو. بریندار؛ زامار ≡ زخمی

**چوێشتیر** / ç(i)wêştir/: ناو. چتوور؛ چتیر؛ چوتیر؛ چوشتر؛ چوشتیر؛ چویشتیر؛ چێشتیر؛ تیشتیر؛ تێشتیر؛ توێشتیر؛ بزنی دوو ساڵە ≡ بُز دو ساله

**چوێلەکە** / ç(i)wêleke/: ☜ **چۆلەکە**

**چوێڵ** / ç(i)wêł/: ئاوەڵناو. لار؛ خوار؛ خێچ؛ (بارەبەر) ≡ کج (باربر)

**چۆ**[١] / ço/: ناو. ١. چێو؛ دار ٢. ☜ **چق**[١]**ـ٢** ≡ ١. چوب ٢. ☜ **چق**[١]**ـ٢**

**چۆ**[٢]: ئاوەڵکار. ئەوێ؛ ئەویا ≡ آنجا

**چۆ**[٣]: جێناو. ئەوێ؛ ئەوێنە ≡ آنجا

**چۆب** / çob/: ☜ **چق**[١]**ـ٢**

**چۆپ** / çop/: ناو. ١. کێرەگا؛ ڕەگی کێری گا، وشک دەکرا و دەکرایە برگە بۆ قەڵەم دادان ٢. لای چەپ ٣. فڕ؛ درۆ ≡ ١. مقطع قلم نی که از ذکر خشکیده‌ی گاو می‌ساختند ٢. چپ ٣. دروغ

**چۆپاندن** / çopandin/: چاوگ. تالان کردن؛ چەپاو کردن ≡ چپاول کردن

**چۆپچۆپان** / çopçopan/: ناو. چۆپچۆپێن؛

جەنگەی بەهار کە گۆچان لە ناو گیادا ون دەبێ 🇮🇷 عنفوان بهار و زمان رشد گیاهان

**چۆپچۆپێن / çopçopên/:** ☜ **چۆپچۆپان**

**چۆپڕ[1] / çopiř/:** ناو. کوێرێ کە جێ چاوی نییە 🇮🇷 کوری کە کاسەی چشم ندارد

**چۆپڕ[2]:** ناوەلناو. پەرژ و بلاو 🇮🇷 پراکندە

**چۆپڕیان / çopiřyan/:** چاوگ. بلاو بوون؛ پەرژان 🇮🇷 پراکندە شدن

**چۆپڵمە / çopiłme/:** ناو. سندان؛ نەخۆشی هەلتۆقانی سینگی ولاخ 🇮🇷 از بیماری‌های احشام

**چۆپە[1] / çope/:** ناو. لای چەپ 🇮🇷 سمت چپ

**چۆپە[2]:** ناوەلناو. چەپلەر؛ چەپدەس؛ چەپە؛ چەپیل؛ چەپێل؛ چەپێل؛ فێرەکار بە دەستی چەپ 🇮🇷 چپ‌دست

**چۆپەمە / çopeme/:** ☜ **چێوپەمە**

**چۆپەوانە / çopewane/:** ناوەلناو. ١. پێچەوانە؛ بەراوەژوو ٢. چەپلەر 🇮🇷 ١. برعکس ٢. چپ‌دست

**چۆپی / çopî/:** ناو. ١. دیلان؛ هەلپەڕکێ ٢. دەسرۆکەی دەستی سەرچۆپیگر 🇮🇷 ١. رقص گروهی کُردی ٢. دستمال دست سردستەی رقص

**چۆپیک / çopîk/:** ناوەلناو. گێلۆکە؛ کەمزان 🇮🇷 هالو

**چۆپیکێش / çopîkêş/:** ناو. سەرچۆپی؛ ڕەمکێشی دیلان 🇮🇷 سردستە در رقص کُردی

**چۆت / çot/:** ناو. بزن 🇮🇷 بُز

**چۆجەلە / çocele/:** ناو. داررووکەی قایم کردنی تەختە کوین بە یەکەوە 🇮🇷 قطعەی چوبی کە پارچەهای چادر را بە هم پیوند دهد

**چۆحەلێن / çoĥelên/:** ناو. چوحەلین؛ هەلووکێن؛ هەلووکان 🇮🇷 بازی الک‌دولک

**چۆخ / çox/:** ناو. ١. پەستەک ٢. کولەبال ٣. فاسۆنی 🇮🇷 ١. جلیقە ٢. نیمتنەی نمدی ٣. فاستونی

**چۆخان / çoxan/:** ناو. ئەسپۆن؛ سپۆن؛ بنەگیایەکە جلی پێ دەشۆن 🇮🇷 چوبک

**چۆخک / çoxik/:** ☜ **چۆخە ـ١**

**چۆخە / çoxe/:** ناو. ١. چۆخک؛ چۆغە؛ سەرکەوای لە مەرەز یان خوری ٢. مەلێکی بچووکی کوێستانی، تۆزێ لە پاساری گەورەتر و دوو جۆری هەیە 🇮🇷 ١. چوخا ٢. پرندەای است

▣ **چۆخە بازەڵە:** جۆرێ چۆخە کە سەر باڵەکانی سپییە و لە ناو دیوار و بەرد و کەلەکدا هێلانە دەبەستێ 🇮🇷 پرندەای است

**چۆخە داری:** جۆرێ چۆخە کە زۆرتر بۆرە و لە سەر دار هێلانە دەکا 🇮🇷 پرندەای است

**چۆخەورانک / çoxe w řanik/:** ناو. رانکوچۆخە؛ جلوبەرگی کوردی پێکهاتوو لە کەوا و شەواڵ و شاڵ 🇮🇷 لباس رسمی کردی

**چۆدار / çodar/:** ناو. چێودار؛ چێوار؛ چەلەبی؛ کەسێ کە مالات دەکڕێ و دەفرۆشێ 🇮🇷 چوبدار

**چۆداری / çodarî/:** ☜ **چێواری**

**چۆدان / çodan/:** ☜ **چاودار ـ١**

**چۆرت[1] / çort/:** ناو. ١. ☜ **چۆرتکە** ٢. چورت؛ چرت؛ سەرخەو؛ سووکەخەو؛ وەنەوز 🇮🇷 ١. ☜ **چۆرتکە** ٢. چُرت

▣ **چورت دان:** چورت/ وەنەوز دان؛ سەرخەو شکاندن 🇮🇷 چُرت زدن

**چۆرت شێوان:** چۆرت بڕان 🇮🇷 چُرت پارە شدن

**چۆرت[2]:** ☜ **چۆرس**

**چۆرتان / çortan/:** ناو. کەشک 🇮🇷 کشک

**چۆرتکە / çortke/:** ناو. چۆرت؛ ئامرازێ بۆ ژماردن، بە چوارچێوە و میلەگەلێکەوە کە یەکێ ١٠ مۆرەیان پێوەکراوە و بە جێبەجێ‌کردنی مۆرەکان دەکرێ هەر چوار کاری سەرەکی ژماردن (بەتایبەت لێ‌زیاد کردن و کەم کردنەوە) ئەنجام بدرێ 🇮🇷 چُرتکە

▣ **چۆرتکە داخستن:** ١. چۆرتکە لێدان؛ بە چۆرتکە حیساب کردن ٢. *[کینایە]* پێشەکی و لەبەر

خۆوە حیساب لەسەر شتێک کردن ☰ ١و٢. چرتکە انداختن

**چۆرتکە لێدان**: ☜ **چۆرتکە داخستن**

**چۆرتم / çortim/**: ناو. ١. چورت؛ وەنەوز ٢. چەترمە؛ بەڵا و بەسەرهاتی خراپ ☰ ١. چُرت ٢. مُصیبت

**چۆرس / çors/**: ئاوەڵناو. چۆرت: ١. بێ‌ئەدەب؛ بێ‌ئاکار؛ ڕەوشت‌خراپ ٢. بەربەڕ؛ وەحشی؛ دوور لە شارستانییەت و فەرهەنگ ☰ ١. بی‌ادب ٢. بی‌تمدن

**چۆرسی / çorsî/**: ناو. بێ‌ڕێزی؛ بێ‌حورمەتی ☰ بی‌حُرمتی

**چۆرەک / çorek/**: ناو. جۆرێ کولێرە ☰ نوعی گردە نان

**چۆرین / çorîn/**: ناو. گیایەکی بۆنخۆشە ☰ گیاهی خوشبو

**چۆڕ / çoř/**: ناو. ١. دڵۆپ؛ تنۆک ٢. سپیاتی ٣. قەرقاوڵ ☰ ١. قطره ٢. سفیدی ٣. قرقاول

⊡ **چۆڕ لێبڕین**: ١. وشک کردن؛ نەهێشتنی سەرچاوەیەک ‹چۆڕیان لەو کاریزانە بڕی› ٢. بەتاڵ کردن؛ خاڵی کردن و بە کار هێنانی تەواوی تراوێک لە دەفرێکدا ‹چۆڕمان لەو گۆزە بڕی› ٣. [مەجاز] لە نێو بردن؛ نەهێشتن ‹ڕاوچی، چۆڕیان لە کەو بڕی› ☰ ١. خشک کردن ٢. خالی کردن (از مایع) ٣. از بین بُردن

**چۆڕ تێدا نەبوون**: هیچ (تراو) تێدا نەبوون؛ خاڵی بوون ☰ خالی بودن (از مایع)

**چۆڕاڵ / çořał/**: ئاوەڵکار. چۆڕقاڵ؛ چۆڕقاڵ؛ چۆڕکاڵ؛ چۆڕکە؛ ئاوێکی کەم ☰ آب یا مایع اندک

**چۆڕان / çořan/**: ☜ **چۆڕانەوە**

**چۆڕاندن / çořandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //چۆڕاندت؛ دەچۆڕێنی؛ بچۆڕێنە// چۆڕاندنەوە؛ جوورنای: ١. تکاندنەوە؛ چکاندن ٢. ئاخر تنۆک لێ‌داتکاندن ☰ ١. چکاندن ٢. خشکانیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەچۆڕاندن

**چۆڕاندنەوە / çořandinewe/**: ☜ **چۆڕاندن**

**چۆڕانەوە / çořanewe/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //چۆڕایەوە؛ دەچۆڕێیەوە؛ بچۆڕێوە// چۆڕان: ١. داکەوتنی دلۆپە لە شتی تەڕ ٢. هاتنە خواری ئاوی باران دلۆپ ـ دلۆپ بە دار و بەرددا ☰ ١. چکیدن ٢. قطره ـ قطره چکیدن آب باران

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: چۆڕاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەچۆڕانەوە

**چۆڕاوکە / çořawke/**: ناو. ڕەوتی هاتنە خوارەوە بە تک ـ تک (وەک باران بە پلووسکدا) ☰ ریزش قطرات

**چۆڕاوگە / çořawge/**: ناو. جێگەی بە دلۆپە هاتنە خواری ئاو ☰ مسیر قطره ـ قطره چکیدن

⊡ **چۆڕاوگە بەستن**: چۆڕانەوە ‹خوێن بە پشتیدا چۆڕاوگە دەبەستێ› ☰ قطره ـ قطره چکیدن

**چۆڕبڕ**[1] **/ çořbiř/**: ناو. چۆڕەبڕ؛ کاتی وشک بوون؛ دواهەمین کات ‹تا چوڕبڕ لەگەڵتان دەمێنمەوە› ☰ آخر

**چۆڕبڕ**[2]: ئاوەڵناو. چۆڕەبڕ؛ ویشکاو؛ ئیشکاو ‹کانیاوی وشک و چۆڕبڕ› ☰ خشکیده

**چۆڕپۆڕ / çořpoř/**: ناو. قەرقاوڵ ☰ قرقاول

**چۆڕ ـ چۆڕ / çoř çoř/**: ئاوەڵکار. دلۆپ ـ دلۆپ ‹دۆشاو هەڵئەقوڕا بە چنگ و کەوچک/ ئەڕژایە بەر پێ چۆڕ ـ چۆڕ و تک ـ تک «گۆران»› ☰ قطره ـ قطره

**چۆڕس / çořis/**: ناو. قسەی لە سەر دڵ گران ☰ ناسزا

**چۆڕقال / çořqal/**: ☜ **چۆڕاڵ**

**چۆڕقاڵ / çořqał/**: ☜ **چۆڕاڵ**

**چۆڕکاڵ / çořkał/**: ☜ **چۆڕاڵ**

**چۆڕکە / çořke/**: ☜ **چۆڕاڵ**

**چۆڕگە / çořge/**: ناو. جێگەی لێ‌چۆڕانی ئاو ☰

جای چکیدن آب

**چۆڕۆ** / çořo/: ناو. بەرەوژووریی؛ سەرەژووورە ⇐ سربالایی

**چۆڕە** / çoře/: ناو. چۆڕ؛ دلۆپ ⇐ شرە

▣ **چۆڕە کردن:** دلۆپە کردن ⇐ چکیدن

**چۆڕە لێبڕان:** تک تێدا نەمان؛ تک لێبڕان. هەروەها: **چۆڕە لێبڕین** ⇐ خُشک شدن

**چۆڕەبڕ** / çořebiř/: ☜ **چۆڕبڕ**

**چۆڕەپۆپنە** / çořepop(i)ne/: ناو. تیفــرگ؛ چوێلەکەیەکی کاکۆڵبەسەرە ⇐ شانەبەسر

**چۆڕەپۆپنەکی** / çořepop(i)nekî/: ☜ **چورەپۆپنەکی**

**چۆڕەچۆڕ** / çořeçoř/: دەنگەناو. شۆڕەشۆڕ ⇐ شُرـ شُر

**چۆڕیان** / çořyan/: چاوگ. هەڵچۆڕان؛ ئاو لێخەلاس بوون ⇐ چکیدن آخرین قطرات

**چۆڕیانەوە** / çořyanewe/: چاوگ. تنۆک ـ تنۆک ئاو لێهاتن تا وشک بوونەوە ⇐ تا آخرین قطرە چکیدن

**چۆڕین** / çořîn/: چاوگ. تکان؛ تکیان ⇐ چکیدن

**چۆڕێ** / çořê/: ئاوەڵکار. کەمێک (تراو) ‹چۆڕێ ئاومان بەرێ› ⇐ اندکی (مایع)

**چۆسلی** / çoslî/: ناو. پەین؛ پەیین ⇐ پِهن

**چۆسڵە** / çosłe/: ناو. خلێنکە؛ گووخلێنکە؛ گووخلێنکە؛ گووگلێن ⇐ سرگین‌غلتان

**چۆش** / çoş/: دەنگ. ۱. هۆش؛ وەوش؛ وشەی کەر ڕاوەستاندن ۲. وشەیەک لە سەردەمی پێ گرتنی منالدا دەگوترێ ⇐ ۱. هُش ۲. کلمەای کە هنگام سر پا ایستادن بچەی نوپا گفتە می‌شود

▣ **چۆش کردن:** ڕاوەستان؛ بە پێوە وەستانی منداڵ ⇐ سر پا ایستادن بچە

**چۆغان** / çoğan/: ناو. گیایەکە وەک ئەسپۆن کەف دەکا ⇐ گیاهی شبیە چوبک

**چۆغک** / çoğik/: ناو. چۆغەڵ: ۱. چۆغە؛ سەرکەوای لە شاڵ ۲. پەسەک؛ پەستەک ⇐ ۱. نیمتنەی از جنس شال ۲. نیمتنەی نمدی

**چۆغڵ** / çoğił/: ناوەڵناو. دەغەڵ؛ فێڵباز؛ ناڕاست ⇐ ناروزن

**چۆغە** / çoğe/: ناو. ۱. ☜ **چۆخە-۱** ۲. پەستەک؛ پەسەک ⇐ ۱. ☜ **چۆخە -۱** ۲. نیمتنەی نمدی

**چۆغەبازەڵە** / çoğebazełe/: ناو. بەچکەساوای بەراز ⇐ نوزاد گُراز

**چۆغەڵ** / çoğeł/: ☜ **چۆغك**

**چۆغەڵە** / çoğełe/: ناو. تێکولی برنج؛ بەرگە چەڵتووک ⇐ پوستەی شلتوک

**چۆڤ** / çov/: ناو. داردەست؛ داردەست ⇐ چوبدستی

**چۆڤان** / çovan/: ناو. گیایەکە کەف دەکا و بۆ شۆردن بە کار دێ ⇐ گیاهی شبیە چوبک

**چۆڤانن** / çovanin/: چاوگ. ۱. بەتاڵ کردن ۲. قووچاندن ⇐ ۱. باطل کردن ۲. بر هم نهادن

**چۆق**[1] / çoq/: ناو. لەرز لە نۆبەتیدا ⇐ لرز

**چۆق**[2]: دەنگەناو. دەنگی داغ بوونی ڕۆن لە سەر ئاگر ⇐ صدای داغ شدن روغن

**چۆقان** / çoqan/: چاوگ. ۱. هەڵقرچان؛ قرچیان؛ داغ بوونی ڕۆن ۲. لەرزین (لە نۆبەتی و ...) ⇐ ۱. داغ شدن روغن ۲. لرزیدن

**چۆقاندن** / çoqandin/: چاوگ. چۆقانن: ۱. داغ کردنی ڕۆن ۲. لەرزیان لە سەرما ⇐ ۱. داغ کردن روغن ۲. لرزیدن

**چۆقانن** / çoqanin/: ☜ **چۆقاندن**

**چۆقاو** / çoqaw/: ناوەڵناو. هەڵقرچاو؛ هەڵقرچیاگ ⇐ تفیدە

**چۆقە**[1] / çoqe/: ناو. چەق‌وچۆ؛ لەرزی نۆبەتی ⇐ لرز تبدار

**چۆقە**[2]: دەنگەناو. ۱. قرچەی سووتانی چڵ و چێو ۲. دەنگی وێک‌کەوتنی ددان لە سەرمان ⇐ ۱. صدای سوختن شاخ و برگ ۲. صدای بە هم خوردن

دندان‌ها از سرما

**چۆقی / çoqî/**: ناو. زانای ئێزدی ▤ دانای ایزدی

**چۆقیان / çoqyan/**: ☜ **چۆقین**

**چۆقین / çoqîn/**: چاوگ. چۆقیان: ١. لەرزین لە سەرما یان نۆبەتی ٢. هەڵقرچانی ڕۆن لە سەر ئاگر ▤ ١. لرزیدن از تب یا سرما ٢. تفیدن

**چۆک / çok/**: ناو. چۆنگ؛ ئەژنۆ؛ وژنگ؛ زرانی ▤ زانو

⊡ **چۆک بە چۆک دانیشتن**: لووت بە لووت دانیشتن؛ دانیشتن بەرامبەر بە یەک و زۆر نزیک بە یەک ‹چۆک بە چۆک دانیشتین و قسەمان کرد› ▤ زانو به زانو نشستن

**چۆک دادان**: چۆک دان: ١. لە سەر ئەژنۆ دانیشتن ٢. *[کنایه]* بەزین؛ کۆڵ دان ٣. *[کنایه]* هاتنە سەر چۆک؛ شاگردی کردن و بە ڕێزەوە لە بەر دەمی مامۆستا دانیشتن ‹ماوەی دوو ساڵ لە خزمەتی مامۆستا چۆکی داداوە و سەرف و نەحوی خوێندووە› ▤ ١. نشستن روی زانو ٢. تسلیم شدن ٣. زانو زدن

**چۆک دان**: ☜ **چۆک دادان**

**چۆک دانە سەر**: ئەژنۆ لە سەر سنگ دانان ▤ زانو را بر سینه نهادن

**چۆک شکان**: *[کنایه]* ئەژنۆ شکان؛ تاسان ‹لە ترسانا چۆکی شکا و زمانی گیرا› ▤ کیش ـ مات شدن

**چۆک هەڵدان**: چۆک هەڵنان؛ چۆک هەڵێنان؛ ئەژنۆ بەرز کردنەوە ▤ زانو بلند کردن

**چۆک هەڵنان**: ☜ **چۆک هەڵدان**

**چۆک هەڵێنان**: ☜ **چۆک هەڵدان**

**چۆکا خوە کوتان**: *[کنایه]* پەشیمان بوون ‹پشت کو کەچکاوی رەڤ، چۆکا خوە کوتا خوە کوتالێ مخابن کو چڤێک ژ هێلینێ قەتیا بوو «هەرەمەنگا بوێژان»› ▤ کیش ـ مات شدن

**چۆکار / çokar/**: ناو. چێوکار؛ دارتاش ▤ نجار

**چۆکانێ / çokanê/**: ناو. کاری لە سەر چۆک دانیشتن ▤ زانو زدن

**چۆکشکێنە / çokş(i)kêne/**: ناو. سەرئاسنینە؛ سەپان‌ترێنە؛ جۆرێک دڕووی پڕئازار ▤ نوعی خار

**چۆگان / çogan/**: ناو. گۆچان؛ گۆپاڵ؛ داردەستی سەرخوار ▤ عصا

**چۆگە**[1] **/ çoge/**: ناوەڵکار. ئەوێ؛ وێدەرێ؛ ور ‹باڵەکات چۆگە بنیەرە› ▤ آنجا

**چۆگە**[2]: جێناو. ئەوێ؛ وێدەرێ؛ ور ▤ آنجا

**چۆل**[1] **/ çol/**: ناو. دەشت و دەر ▤ دشت؛ صحرا

**چۆل**[2]: ☜ **چۆڵ**

⊡ **چۆل بوون**: کەس لێ نەمان ▤ خالی از سکنه شدن

**چۆلانێ / çolanê/**: ناو. هەنگلەشەلە؛ گەمەی لە سەر یەک پێ ڕۆیشتن ▤ لی ـ لی

**چۆلبڕ / çolbiř/**: ناو. ١. گەرێدەی عەوداڵ ٢. کاری بە لاڕێدا ڕۆیشتن ▤ ١. خانە بە دوش ٢. عمل از بیراهه رفتن

**چۆلپەرست / çolperist/**: ☜ **چۆڵپەرست**

**چۆلتەر / çolter/**: ☜ **چۆڵەوار**

**چۆلچڕ / çolçiř/**: ناو. هەوای گۆرانی شیاوی چۆل و دەشت ▤ آوازی که در دشت‌ها خوانند

**چۆلخە / çolxe/**: ناو. کەسێ کە خوری ئاژاڵ بە برینگ دەبڕێتەوە ▤ پشم‌چین

**چۆلک / çolik/**: ناو. *[کنایه]* خەلا؛ ئاودەست؛ پێشاو ▤ مستراح

**چۆلگە / çolge/**: ☜ **چۆڵگە**

**چۆلنشین / çoln(i)şîn/**: ☜ **چۆڵپەرست**

**چۆلوار / çolwar/**: ☜ **چۆڵەوار**

**چۆلە / çole/**: ناو. قەیسی و بادامی سەوزی نەگەییو ▤ چغاله

**چۆلەچراو / çoleç(i)raw/**: ☜ **چۆڵەچرا**

**چۆلەچۆل / çoleçol/**: دەنگەناو. بۆڵەبۆڵی ورچ ▤

همهمەی خرس

**چۆلەکە / çoleke/**: ناو. چوێلەکە؛ چوولەکە؛ چێشکە؛ چوچک؛ چووچک؛ چویچ؛ چویک؛ چووک؛ چیچک؛ چیک؛ چوول؛ چوول؛ چیویک؛ مرچک؛ مریچلە؛ مریچلە؛ ملیچک؛ مەلوچک؛ مەلویچکە؛ مەلیچک؛ مەلووچک؛ مریچک؛ میرچک؛ مەلیچە؛ مریچکە؛ مەلیشکە؛ پاساری؛ پاسارو؛ مەلووچ؛ مەلیچلێ؛ میچلێ؛ مریچلێ؛ مۆرووچلێ؛ چێژیلە؛ چیچکا؛ چیریلە؛ چیچک؛ جکە؛ جککە؛ چڤیک؛ چڤینک؛ چڤینگ؛ جیڤک؛ جووجک؛ جووک؛ جیجک؛ جوونجک؛ ساندیلکە؛ تیڤۆک؛ سەرچە؛ چومک؛ کێشکە؛ کێشوولە؛ کێشوەلە؛ کێژکە؛ کیژکە؛ کێژۆلە؛ کێژوولە؛ کوێژکە؛ کوێژیلە؛ کوێشکە؛ کویشکە؛ کیشکە؛ دێمەرە؛ شڤاندیلکە؛ سواندوولکە؛ سواندیلکە؛ سێڤاندیلکە؛ سێڤاندۆک؛ سێڤاندۆکە؛ سواندۆکە؛ سواندووکە؛ بەیتەک؛ بەیتاک؛ بێتک؛ باڵندەیەکی چکۆلەی دانخۆرە بە دەندووکی خڕ و پێی کورتەوە، لە سەر زەوی، لقی داران، کون و کەلێنی دیواران هێلانە دەکا، نزم و کورت دەفڕێ، بە گەل دەژین و یازدە جۆریان هەیە ☰ گُنجشک

**چۆلەکەبکوژ / çolekeb(i)kuj/**: ناو. /کینایە/ مشەکەر؛ مرۆی زیندوو ☰ آدم زنده

**چۆلەکە پەرچە / çolekeperçe/**: ناو. باڵندەیەکە نزیک بە ۱۰ سانتیمیتر دەبێ، کلکی درێژ و سەر کلکی خڕە، پشتی قاوەیی و سەری ڕێ ـ ڕێیە، زیاتر کلکی قیت ڕادەگرێ، لە سەر عەرز چینە دەکا، دایم لە هاتوچۆدایە، نەوی دەفڕێ، لە نێو بەردەڵان دەژی و لە نێو پنچکاندا هێلانە ساز دەکا ☰ سسک‌جنبان

**چۆلەکەچۆمە / çolekeçome/**: ناو. بەرلووزەو؛ مەلێکی چۆلەکەئاسای دەنگخۆشە لە قەراخ ئاوی خوڕ دەژی و بۆ ڕاو خۆی دەخاتە بن ئاوەوە و تا ماوەیەک دەمێنێتەوە ☰ زیرآبروک

**چۆلەکەسەیدانە / çolekeseydane/**: ناو. جۆرێک چۆلەکە ☰ نوعی گُنجشک

**چۆلەکەگرە / çolekeg(i)re/**: ناو. پەربەڵەکە ☰ پرندەی سنگ‌چشم

**چۆلەکەمشکە / çolekem(i)şke/**: ناو. جۆرێک چۆلەکەی زۆر وردە، لە نێو لق‌وپۆی داردا دەژی ☰ الیکایی

**چۆلەم / çolem/**: ناو. چۆل و بیابانی بێ ئاوەدانی ☰ بیابان برهوت

**چۆلی / çolî/**: ناو. چۆلیەتی؛ والا ☰ خالی از سکنه

**چۆلیەتی / çolyetî/**: ☜ **چۆلی**

**چۆڵ[1] / çoł/**: ناو. چۆل؛ بیاوان و جێگەی دوور لە ئاوەدانی ‹تەرک شاهیم کەرد لۆنگم وەست نە کۆڵ/ چۆلم کەرد وە زێد زێدم کەرد وە چۆل «خانای قوبادی»› ☰ بیابان

**چۆڵ[2]**: ئاوەڵناو. چۆل؛ خالی ☰ خلوت

▣ **چۆڵ کردن**: کەلپەل لێ دەرهێنان و تێدا نەمان (بۆ ماڵ و مەلبەند) ‹چیتر لەم ماڵە نابێ دانیشن و دەبێ تا بەیانی چۆڵی کەن› ☰ خالی کردن (خانە و ...)

**چۆڵ[3]**: پێرِو. ← **چەك‌وچۆڵ**

**چۆڵاو / çoław/**: ناو. کار و ڕەوتی چیلکە چەقاندن بە دەوری سەوەتەوە بۆ زۆرتر دیران ☰ کار فرو کردن چوب در سبد برای افزایش گنجایش

**چۆڵایی / çołayî/**: ناو. نژار؛ جێگەی چۆڵ ☰ جای خالی

**چۆڵبڕ / çołbiř/**: ☜ **چۆڵگەرد**

**چۆڵپەرست / çołperist/**: ئاوەڵناو. کۆچەر؛ چۆلپەرەست؛ چۆلپەرست؛ چۆل‌نشین؛ چادرنشین ☰ چادرنشین

**چۆڵپەرەست / çołperest/**: ☜ **چۆڵپەرست**

**چۆڵستان** / çołistan/: ☜ **چۆڵگە**

**چۆڵگە** / çołge/: ناو. چۆلستان؛ چۆلگە؛ سارا و بیابان ☰ بیابان

**چۆڵگەرد** / çołgerd/: ناوەڵناو. بیابانگەرد؛ چۆلبڕ؛ کۆچەری بیاوان‌نشین ☰ بیابانگرد

**چۆڵنشین** / çołn(i)şîn/: ☜ **چادرنشین**

**چۆڵوهۆڵ** / çoł û hoł/: ناوەڵناو. چۆڵ؛ هیچ تێدا نا ☰ برهوت

**چۆڵە** / çołe/: ناو. ↓

⊡ **چۆڵە دان**: ☜ **چۆڵەپێچەن دان**

**چۆڵەپێچ** / çołepêç/: ناو. ١. تووڵەپێچ؛ چۆلەمەپێچ؛ کاری دەرهێنانی نچیری وەک کەروێشک و ڕێوی لە کون بە دارێکی دووفلیقانە ٢. کاری ڕاو کردنی کەو لە کاتی کڕ کەوتنی ماکەودا ٣. گولۆلەپێچ؛ تەناف‌پێچ ٤. کاری شەتەک دانی بار و شەغرە لە سەر پشتی یەکسم و توند کردنی بە دارێکی چکۆلە ٥. کاری شەوژەن کردنی دەرگا ☰ ١. نوعی شکار روباه و خرگوش ٢. شکار کبک در ایامی که ماده کبک کرچ است ٣. طناب‌پیچ ۴. محکم کردن بار با چوبی کوتاه ۵. کار کلون کردن در

⊡ **چۆڵەپێچ دان**: توند و تۆڵ کردنەوەی بار بە بادانی گوریس بە چوکڵ و چێو ☰ روشی برای محکم کردن بار

**چۆڵەپێچەن** / çołepêçen/: ناو. ↓

⊡ **چۆڵەپێچەن دان**: چۆلەدان: ١. سفت کردنەوەی تەنگی بار بە چوکڵە یا پارچە چێوێکی کورت کە دەکرێتە ژێر گوریس یا تەنافدا و هێندە پێچ دەدرێ تا تەواو سفت دەبێتەوە ٢. *[کینایە]* خستنە تەنگانەوە ☰ ١. روشی برای محکم کردن بار ٢. تحت فشار قرار دادن

**چۆڵەچرا** / çołeç(i)ra/: ناو. ئەختەرمە؛ چلووسک؛ چاولە؛ چۆلەچراو ‹چۆلەچرایێ پەرێ وێت سازدەر/ وە قەد تەوانای وێت باربەندی کەر «مەولەوی»› ☰ مشعل هیزمی

**چۆڵەمە** / çołeme/: ناو. ١. چۆلەمێ؛ چەلەمە؛ ئێسکێکی دووفلیقانە لە نێوان باڵ و ملدا ٢. ئالقەی دارین لە ملی گادا ☰ ١. جناغ ٢. حلقەی چوبی گردن گاو

**چۆڵەمەپێچ** / çołemepêç/: ☜ **چۆڵەپێچ**

**چۆڵەمەشکانێ** / çołemeş(i)kanê/: ☜ **چەلەمەشکێتە**

**چۆڵەمەشکێنە** / çełemeş(i)kêne/: ☜ **چەلەمەشکێتە**

**چۆڵەمێ** / çołemê/: ☜ **چۆڵەمە-١**

**چۆڵەوار** / çołewar/: ناو. چۆلتەر؛ چۆلوار: ١. دوورەشار؛ لادێ ٢. چۆلگە؛ شوێنی دوور لە ئاوەدانی ☰ ١. روستا ٢. بیابان

**چۆڵەوانی** / çołewanî/: ناو. ١. چۆلایی ٢. دەشتەوانی ٣. *[کینایە]* کشت و کاڵ لە کێو و دەشتدا ☰ ١. جای دنج و خلوت ٢. دشتبانی ٣. کشت و زرع در مزارع و مراتع

**چۆڵی** / çołî/: ناو. بێ‌ئاوەدانی ☰ مُستراح

**چۆم** / çom/: ناو. چەم؛ چۆمی؛ ڕووبار؛ ڕۆخانە ☰ رودخانە

**چۆماخ** / çomax/: ناو. ١. شەپلاخە؛ زللە؛ شەقەزللە؛ شەپازللە؛ شەقام ٢. گۆپاڵ؛ چۆماغ؛ تێلا ☰ ١. سیلی ٢. چُماق

**چۆماغ** / çomağ/: ☜ **چۆماخ-٢**

**چۆماندن** / çomandin/: ☜ **چەماندن**

**چۆماندنەوە** / çomandinewe/: ☜ **چەماندن**

**چۆمانەوە** / çomanewe/: ☜ **چەمانەوە**

**چۆمەڵ** / çomeł/: ناو. چۆمی چکۆلە و کەم‌ئاو ☰ رود کوچک

**چۆمی** / çomî/: ☜ **چۆم**

**چۆن**[1] / çon/: ئاوەلناو. چلۆن؛ کوو؛ چاوا ‹دەنگی چۆنە؟؛ چۆن کچێکە؟› 🇮🇷 چگونه

**چۆن**[2]: ئاوەلکار. چلۆن؛ کوو؛ چاوا ‹چۆن گیرا؟؛ چۆن مرد؟› 🇮🇷 چگونه

**چۆنایەتی** / çonayetî/: ناو. چۆنیەتی 🇮🇷 چگونگی

**چۆنگ** / çong/: ناو. ۱. چەق؛ ناوەند؛ ناوەڕاست؛ شوێنی ناوەندیی لە مەڵبەندێکا ۲. ☜ چۆك 🇮🇷 ۱. مرکز ۲. ☜ چۆك

**چۆنەتی** / çonetî/: ناو. حالەت؛ چۆنیەتی 🇮🇷 حالت

**چۆنەر** / çoner/: ☜ چەوەندەر

**چۆنەری** / çonerî/: ☜ چەوەندەر

**چۆنەرین** / çonerîn/: ناو. چەوەندەر بە ترش؛ چێشتی سماق و چەوەندەر 🇮🇷 آش سماق و چغندر

**چۆنەها** / çoneha/: ئاوەلکار. بە دەگمەن؛ مەگەرچی ‹چۆنەها شتی وا ڕوو بدا› 🇮🇷 به نُدرت

**چۆنیەتی** / çonyetî/: ناو. چلۆنایەتی؛ چلۆنەتی 🇮🇷 چگونگی

**چوو**[1] / çû/: ناو. ۱. جەنجەڕ؛ جەڕجەڕ ۲. داردەست ۳. داری بێ تێکوڵ ٤. جگ؛ میچ؛ قاپ ٥. کیری منداڵ ٦. بەند ــ بەندی ئەندام 🇮🇷 ۱. خرمنکوب ۲. چوبدستی ۳. چوب پوست‌کنده ۴. قاب‌بازی ۵. ذکر طفل ۶. بند ـ بند اندام

**چوو**[2]: ئاوەلناو. لە سەرمان تەزیو 🇮🇷 کرخت از سرما

**چوو**[3]: ئاوەلکار. ۱. ئەوێ؛ ئەویا؛ ئێنە؛ ئوێنە ‹چوویێ نیشە!› ۲. چۆن؛ چۆنین ‹چوو زانم› 🇮🇷 ۱. آنجا ۲. از کجا

**چوو**[4]: جێناو. ئەوێ؛ ئەویا؛ ئێنە؛ ئوێنە ‹مام سۆفی ئەوە چوو بیخوا؟!› 🇮🇷 آنجا

**. چوو**[5]: پاشەوشە. بەبڕشت ‹دەسچوو› 🇮🇷 توانا

**چووبەچوو** / çûbeçû/: ئاوەلناو. داربەدار؛ پاک‌لەپاک؛ تۆلەبەتۆلە 🇮🇷 سر به سر

**چووپەمە** / çûpeme/: ☜ چێوپەمە

**چووچ** / çûç/: ناو. ۱. چوو؛ کیری منالی ساوا ۲. میزەڕۆ؛ ڕەگی میز پێدا هاتن 🇮🇷 ۱. ذکر نوزاد ۲. میزنای

**چووچک** / çûçik/: ☜ چۆلەکە

**چووچەلە** / çûçele/: ☜ چووچەڵە

**چووچەڵە** / çûçełe/: ناو. *[شوورەیی]* چووچەلە؛ بەلۆکە؛ بلیکە؛ بەلەمیتکە 🇮🇷 چوچوله

**چووچەڵەزڕێ** / çûçełez(i)řê/: ناو. یارییەکە 🇮🇷 از بازی‌ها

**چوور**[1] / çûr/: ناو. ۱. چوو؛ چوچ؛ کیری منداڵ ۲. جۆرێ مەڕ و بزن 🇮🇷 ۱. ذکر طفل ۲. نوعی گوسفند و بُز

**چوور**[2]: ئاوەلناو. شەل 🇮🇷 لنگ

**چووڕ** / çûř/: ناو. تەشقەڵە؛ دەبە؛ گەڕ 🇮🇷 شلتاق

**چووز** / çûz/: ناو. ۱. هێڵی ڕێک ۲. جغز؛ جەغز ۳. ڕیز؛ ڕەدیف ٤. دۆخی ڕیز بوونی سێ چەوە لە گەمەی چووزاندا ٥. چرووی نوێ ٦. بز؛ جۆنگ؛ کلکەبزێ؛ کاری قامک بۆ قوون بردن 🇮🇷 ۱. خط مستقیم ۲. دایره ۳. صف ۴. حالت ردیف شدن سه مُهره در دوزبازی ۵. جوانەی تازه ۶. انگُلک

⊡ **چووز پێوە کردن**: ۱. بز پێوە کردن؛ قامک بۆ قوون بردن ۲. *[کینایە]* دەسکاری کردن ۳. *[کینایە]* ئازار دان 🇮🇷 ۱. انگُلک کردن ۲. دستکاری کردن ۳. اذیت کردن

**چووز کردن**: ۱. موتربە کردن؛ پەیوەند کردن ۲. ڕیز کردنی سێ چەوە لە چووزاندا 🇮🇷 ۱. پیوند کردن درخت ۲. ردیف کردن سه مُهره در دوزبازی

**چووزان**[1] / çûzan/: چاوگ. سووتانەوەی پێست لە تاو بردن و ... 🇮🇷 سوختن پوست از آفتاب و...

**چووزان**[2]: ناو. چووزێن؛ ڕیزان؛ گەمەی ڕیز کردنی چەو 🇮🇷 دوُزبازی

**چووزاندنەوە** / çûzandinewe/: چاوگ. کزاندنەوەی پێست 🇮🇷 سوزش داشتن پوست

**چووزانەوە** / çûzanewe/: چاوگ. چووزینەوە: ۱.

سووتانەوەی پێست ٢. ژان کردنی برین ☰ ١. خارش داشتن پوست ٢. سوزش داشتن زخم

**چووزنا / çûzna/:** ناو. چووەزما؛ چووەزنا؛ خووسار؛ خازی؛ خوزە؛ زوقم ☰ یَخ؛ سرماریزه

**چووزە / çûze/:** ناو. ١. ☜ چز[١]ـ٢ ٢. نێرتکی تازەدەرهاتووی گیا ‹خەرامان مەست حوققەی ناف بە دۆش/ قنیات بە سونبوڵ چووزەی نەرگس نۆش «بێسارانی»› ٣. بەرووڵەی خەیار و ترۆزی ☰ ١. ☜ چز[١]ـ٢ ٢. جوانەی نر گیاه ٣. خیار نورس

**چووزەرە / çûzere/:** ناو. نێرتکی گیا ☰ اندام نر گیاهان

**چووزەریشە / çûzeřîşe/:** ناو. ڕیشۆکە؛ بنەچەکە ☰ ریشەچه

**چووزەشوانە / çûzeş(i)wane/:** ناو. گیایەکە ☰ گیاهی است

**چووزەلاو / çûzelaw/:** ئاوەڵناو. لاوی منالکار و قەدباریک ☰ نوجوان باریک اندام

**چووزەلە / çûzele/:** ناو. تووزەلە؛ دووزەلە ☰ مزمار

**چووزەڵە / çûzeɫe/:** ناو. چووزەرە؛ نێرتکی گیا ☰ نرینەی گیاهان

**چووزیانەوە / çûzyanewe/:** چاوگ. تووزیانەوە ☰ دچار سوزش شدن

**چووزینەوە / çûzînewe/:** ☜ چووزانەوە

**چووزێن / çûzên/:** ☜ چووزان[٢]

**چووقان / çûqan/:** چاوگ. قووچان؛ لێکنان ‹چاوی چووقاند؛ دەستی چووقاند› ☰ بر هم نهادن

**چووقاندن / çûqandin/:** ☜ قووچاندن

**چووقاو / çûqaw/:** ئاوەڵناو. نووقاو؛ قووچاو ☰ بسته؛ برهم آمده

**چووک[١] / çûk/:** ناو. ١. کێری منداڵ ٢. پێستی سەری کیر کە خەتەنە دەکرێ ٣. ☜ چۆلەکە ٤. ناوەرە؛ چیل؛ سنووری ناو دوو زەوی ٥. ملەی کێو ٦. پێنەزانی؛ ناسپاسی ☰ ١. دول؛ آلت تناسلی پسر خُردسال ٢. قَلَفه ٣. ☜ چۆلەکە ٤. مرز فاصل بین دو زمین ٥. ستیغ کوه ٦. ناسپاسی

◘ **چووک خواردنەوە:** پێ نەزانین و دەربڕینی نارەزایی ☰ ناشُکری کردن

**چووک[٢]:** ئاوەڵناو. چکۆلە؛ چکۆڵە؛ پچووک ☰ کوچک

**چووکبڕ / çûkbiř/:** ناو. خەتەنەکەر؛ ئەوی منالان سوننەت دەکا ☰ ختنه‌کننده

**چووکنای / çûknay/:** چاوگ. [پلار] ناسپاسی کردن وێڕای دەربڕینی کەسەر ☰ اظهار عجز و ناسپاسی کردن

**چووکەچرگ / çûkeçirg/:** ناو. جۆرێک چرگە ☰ میش‌مرغ زنگوله بال

**چووکێتی / çûkêtî/:** ناو. پچووکی؛ چکۆلەیی ☰ کوچکی

**چووڵ[١] / çûl/:** ناو. ١. شووڵ؛ تووڵ؛ داروو‌کەی تەڕ و باریک ٢. شۆفاری ٣. چۆلەکە؛ پاساری ☰ ١. ترکه ٢. سخن‌چینی ٣. گنجشک

**چووڵ[٢]:** ئاوەڵناو. چۆڵ؛ خاڵی؛ خەلوەت ☰ خلوت

**چووڵ[٣]:** پێرۆ. ← چەکوچووڵ

**چوولوو / çûlû/:** ئاوەڵناو. شۆفار؛ شەیتانیکەر ☰ سخن‌چین

**چوولە / çûle/:** ئاوەڵناو. گاڵتەباز و قسەخۆش ☰ بذله‌گو

**چوولەکە / çûleke/:** ☜ چۆلەکە

**چوولیت / çûlît/:** ناو. خەزێم؛ لووتەوانە ☰ زینت پرەی دماغ

**چووڵ / çûɫ/:** ☜ چۆلەکە

**چووڵە / çûɫe/:** ناو. کوڵە؛ ژۆژوو؛ ژووشک ☰ جوجه‌تیغی

**چووڵی / çûɫe/:** ناو. چۆڵی؛ بیابان؛ بیاوان ☰ بیابان

**چوومەت / çûmet/:** ناو. چلووسک؛ بزووت؛ سەلکەبزووت ☰ نیم‌سوز

**چوون[١] / çûn/:** چاوگ. تێنەپەڕ. //چووی؛ دەچی؛ بچۆ//

چوین: ۱. ڕۆیشتن؛ ڕۆیین ۲. تێپەڕین؛ بە سەر چوون ‹تازە ئەو سەردەمە چوو کە باپیری حوکماتی دەکرد› ۳. لە دەست بوونەوە؛ لە کیس چوون ٤. بوون؛ بین ‹فێرۆ چوون› ٥. هەڵچوونی چێشت و شیر ‹شیرەکە چوو› ٦. جووت بوونی نێر و مێو ۷. کوژانەوەی ئاگر ۸. تۆقینی هێلکە لە ئاگردا ۹. سڕ بوون لە سەرمان ۱۰. بە ڕەواج بوون ☰ ۱. رفتن ۲. به سر آمدن ۳. از دست رفتن ۴. شدن؛ گشتن ۵. سر رفتن (شیر و ـ) ۶. نزدیکی نر و ماده ۷. خاموش شدن آتش ۸. ترکیدن تخم‌مرغ در آتش ۹. بی‌حس شدن در اثر سرما ۱۰. رواج داشتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: چوو/ چاوگی نەرێنی: نەچوون

**چوون**[۲]: ئاوەڵناو. چلۆن؛ چۆن ☰ چگونه

**چوون**[۳]: ئاوەڵکار. چوون: ۱. چلۆن؛ چۆن ۲. چونکاتێ؛ چوونکوو؛ چون ☰ ۱. چگونه ۲. زیرا

**چوون**[٤]: ئامراز. چو؛ چون: ۱. وەک؛ وەکوو ‹سەیدی تا زیندەن چەنۆ دەردەوە/ چوون مەجنوون وێڵەن بە ڕووی هەردەوە «سەیدی»› ۲. چوونکە؛ چونکوو ☰ ۱. مانندِ ۲. زیرا که

**چوونکوو** / çûnkû/: ☜ **چونکوو**

**چوونگەلە** / çûngele/: ناو. ڕووەکێکی خۆڕسکی دەشتەکییە، لە چێشت دەکرێ ☰ گیاهی است

**چوونەوە** / çûnewe/: چاوگ. تێنەپەڕ. //چوویەوە؛ دەچیەوە؛ بچۆ(ڕ)وە// ۱. گەڕانەوە ‹مەلان چوونەوە سەر کەلانی خۆیان› ۲. بوون ☰ ۱. بازگشتن ۲. شدن؛ گشتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: چووەوە/ چاوگی نەرێنی: نەچوونەوە

**چووە** / çûwe/: ناو. مووی تازە ڕواوی سەر ڕوخساری گەنج ‹تازە پشت لێوی چووەی لێ‌هاتووە› ☰ موی تازه روییده بر رخسار نوجوان

**چووەزما** / çûwez(i)ma/: ☜ **چوزنا**

**چووەزنا** / çûwez(i)na/: ☜ **چوزنا**

**چووەسۆ** / çûweso/: ناو. بڕبەند؛ مڕمەند ☰ سوهان

**چوویت**[۱] / çûyt/: ناو. هەش؛ خوم؛ گیایەکە بۆ ڕەنگی شین دەکار دەکرێ ☰ نیل

**چوویت**[۲]: ئاوەڵناو. چڤیت؛ پاک‌لەپاک ☰ بی‌حساب

**چووین** / çûy(i)n/: چاوگ. ڕۆیشتن؛ ڕۆشتن ☰ رفتن

**چووینە** / çûyne/: ☜ **چێوی**

**چە**[۱] / çe/: ئاوەڵناو. چ؛ چەند؛ چەنێ ‹چە قەشەنگە!› ☰ چقدر

**چە**[۲]: جێناو. بۆ پرسیار دەبێ: *ئا)* بۆ شتومەک ‹چەی سەند؟› *ب)* بۆ کار و کردەوە ‹چە کردی؟› ☰ ـ چە

**چە**[۳]: ئامراز. یەکسانە ‹چە ئەم بیخوا، چە ئەو› ☰ چە؛ خواه

**ـ چە**[٤]: پاشگر. گچکە ‹خوانچە؛ دۆلاوچە› ☰ ـ چە

**چەبت** / çebt/: ناو. جفت؛ جووت؛ کڵاوی بەڕوو ☰ کُلاهک بلوط

**چەپ**[۱] / çep/: ناو. ۱. لای بەرانبەری ڕاست ۲. پلە و دەرەجە ‹چەپێکی دە بەر ئەودا نییە› ۳. لەپ؛ بەری دەست ٤. چەپڵە؛ چەپک؛ کاری دەست لە دەست دان ٥. چەپک؛ چەپکە ٦. پووڵی قومار ☰ ۱. چپ ۲. درجه ۳. کف دست ۴. عمل کف زدن ۵. دسته ۶. پول قمار

⊡ **چەپ تەقاندن** چەپڵە لێدان؛ چەپ کوتان؛ چەپ کوتانن ☰ کف زدن

**چەپ کوتان** ☜ **چەپ تەقاندن**

**چەپ کوتانن** ☜ **چەپ تەقاندن**

**چەپ لێ‌تەقان** *[کینایە]* چەپ لێ تەقاندن/ تەقانن؛ چەپ لێ‌دان؛ قاڵ لێ‌کردن ☰ رسوا کردن

**چەپ لێ تەقاندن/ تەقانن** ☜ **چەپ لێ‌تەقان**

**چەپ لێدان** ☜ **چەپ لێ‌تەقان**

**چەپ**[٢]: ئاوەڵناو. ١. خوار و خێچ ٢. دوورکەوتە 🇮🇷 ١. کج و کوله ٢. دورافتاده

◘ **چەپ بوون:** هەڵدێران. هەروەها: **چەپ کردن** 🇮🇷 چپ شدن

**چەپ کەوتن:** ١. دوور کەوتنەوە ٢. تێکچوون ‹تازە لەگەڵی چەپ کەوتوون کارەکەی بۆ جێبەجێ ناکەن› ٣. خراب بوون؛ ئاڵۆز بوون ‹تازە کارەکەی لێ چەپ کەوتووە و وەک خۆی لێنایەتەوە› 🇮🇷 ١. دور افتادن ٢. چپ افتادن ٣. به هم ریختن

**چەپارە** / çepare/: ناو. غیرەت؛ وره 🇮🇷 غیرت

**چەپازلله** / çepazille/: ناو. شەقەزلە 🇮🇷 سیلی

**چەپاڵ** / çepal/: ناو. ١. لای چەپ ٢. لە مەچەکەوە تا سەر قامکان 🇮🇷 ١. طرف چپ ٢. از مُچ دست تا سرانگشتان

**چەپاڵ** / çepał/: ناو. چەپاڵک؛ پەلاس؛ پلاس؛ بەڕەی ساکار 🇮🇷 پلاس

**چەپاڵک** / çepałik/: ☜ **چەپاڵ**

**چەپاڵە**[١] / çepałe/: ناو. ١. پەنا و پەسیو ٢. چەپۆک؛ بە پانی دەستەوە ٣. زللە؛ زیلە؛ زلە؛ شەپازللە؛ شەپەلاغە ٤. لامشت؛ ئەوەندەی شتێ کە دە چالایی چەپ و قامکاندا جێ دەبێتەوە ٥. چەپک؛ دەسە 🇮🇷 ١. پناهگاه ٢. توسری ٣. سیلی ۴. مشت ۵. دسته

◘ **چەپاڵە دان:** پەنا دان؛ داڵدە دان 🇮🇷 پناه دادن

**چەپاڵە**ـ[٢]: پێشوشە. لەڕ و بێگیان ‹چەپاڵەمانگا› 🇮🇷 لاغر

**چەپاندن** / çepandin/: ☜ **چەپانن**

**چەپانن** / çepanin/: چاوگ. چەپاندن؛ ئاخنین؛ تێئاخنین؛ تێتەپاندن 🇮🇷 چپاندن

**چەپاو** / çepaw/: ناو. تالان؛ پویر؛ پووڕ ‹شکست وەردشان، کەردشان فیرار/ غارەت و چەپاو تەمام بێشومار «ئاغا عینایەت»› 🇮🇷 چپاول

◘ **چەپاو کردن:** تالان کردن؛ ڕاماڵین 🇮🇷 چپاول کردن

**چەپت** / çept/: ئاوەڵناو. خوار و خێچ؛ چەبت 🇮🇷 کج و کوله

**چەپچەپی** / çepçepî/: ☜ **چنارەکڵە**

**چەپخواز** / çepx(i)waz/: ئاوەڵناو. چەپی؛ شوێنکەوتوو یان لایەنگری چەپ 🇮🇷 چپگرا

**چەپخوازی** / çepx(i)wazî/: ناو. چەپوازی؛ دۆخی چەپخواز بوون 🇮🇷 چپگرایی

**چەپخووس** / çepxûs/: ئاوەڵناو. خراپەخواز 🇮🇷 بدخواه

**چەپخوون**[١] / çepxûn/: ناو. پەلاماری شەوانە؛ هێرشی لەشکر لە شەودا 🇮🇷 شبیخون

**چەپخوون**[٢]: ئاوەڵناو. ١. بزۆز و سەهەندە ٢. خێڵ؛ خوێل؛ چاولار 🇮🇷 ١. پُرتحرک ٢. لوچ

**چەپدەس** / çepdes/: ☜ **چۆپە**[٢]

**چەپدەست** / çepdest/: ☜ **چەپلەر-١**

**چەپرەک** / çeprek/: ئاوەڵناو. چەپلەک؛ قوڕازە؛ لەکارکەوتوو 🇮🇷 قُراضه

**چەپزاڵی** / çepzałî/: ناو. دۆخی بەهێزتر بوونی ئەندامانی لای چەپی لەش. بەرانبەر: **ڕاستزاڵی** 🇮🇷 چپبرتری

**چەپک** / çepik/: ناو. چەپکە؛ چەپ: ١. چەپلە ٢. چەپە؛ دەسکە؛ هەژمارێک لە شت کە لە دەستدا جێی بێتەوە ‹چەپکێ گوڵ› 🇮🇷 ١. کف ٢. دسته

◘ **چەپک کردن:** دەسە کردن؛ بە شێوەی دەستە ـ دەستە جیا کردنەوەی شتێ 🇮🇷 دسته کردن

**چەپکە** / çepke/: ☜ **چەپك**

**چەپکەگیا** / çepkeg(i)ya/: ناو. چەپە 🇮🇷 دستەی گیاه

**چەپکەن** / çepken/: ناو. ١. کراسی داوێن درێژی ژنان ‹شەو چەپکەنی نەیلووفەریی و جیلوەیی ڕەقسی/ شەرمەندە دەکا زوهرەیی زەهرا لە سەمادا

«نالی»› ٢. نەغمە؛ ڕێگە بە بن زەمینـدا ▣ ١. دامن بلند زنانه ٢. نقب

**چەپگەرد**[1] / çepgerd/: ناو. [پلار] فەلەک؛ ڕۆژگار؛ چەرخ؛ زەمانە؛ گەردوون ‹دل وە کەچبازی فەلەک بازیش وەرد/ جفت ئارەزووم کەرد چەپگەرد تاق ئاوەرد «مەولەوی»› ▣ چرخ بازیگر

**چەپگەرد**[2]: ئاوەڵناو. [مەجاز] خاوەن خوو و خدەی خوار و چەوت ‹سا هەر دوعا کەر با چەرخ چەپگەرد/ تا تاقەتش هەن هەر بشانۆ نەرد «مەولەوی»› ▣ کج‌رفتار

**چەپل** / çepil/: ناو. گەلانکە؛ جار؛ ڕا؛ کەرەت ▣ دفعه

**چەپلە** / çeple/: ☜ چەپڵە

**چەپلەر** / çepler/: ئاوەڵناو. ١. چەپدەست؛ چەپێل؛ چۆپە؛ فێرەکار بە دەستی چەپ ٢. [کینایە] کەمزان؛ ناشی ▣ ١. چپدست ٢. ناشی؛ تازه‌کار

**چەپڵ** / çep(i)ł/: ناو. ١. قۆڵ و باسک ٢. چنگ؛ پەنجە ▣ ١. بازو ٢. پنجه

**چەپڵاخە** / çepłaxe/: ناو. چەک؛ زللە؛ شەپلاخە؛ شەپەزللە ▣ سیلی

**چەپڵاو** / çepław/: ☜ چەپۆ

**چەپڵە** / çepłe/: ناو. چەپ؛ چەپک؛ چەپلە؛ لەپ ▣ کف

⊡ **چەپڵە کوتان**: چەپ کوتان؛ چەپڵە لێدان ▣ کف زدن

**چەپڵە لێدان**: ☜ چەپڵە کوتان

**چەپڵە لێکوتان**: [کینایە] سووکایەتی بە سەر هێنان ▣ آبرو بُردن

**چەپڵەڕێزان** / çepłeřêzan/: ناو. کاری چەپ کوتانی بە کۆمەڵ ▣ عمل کف زدن گروهی

**چەپڵەقوزێ** / çepłequzê/: ناو. [پلار، ناشیرین] کاری دەرکردن بە سووکایەتی ▣ عمل بیرون راندن با اهانت

**چەپڵەک** / çepłek/: ☜ چەپەڕەک

**چەپنای** / çepnay/: چاوگ. چەپاندن ▣ تپاندن

**چەپنگ** / çeping/: ئاوەڵناو. گێل؛ گەوج ▣ ابله

**چەپوازی** / çepwazî/: ☜ چەپخوازی

**چەپوچەوێڵ** / çep û çewêł/: ئاوەڵناو. خوار و خێچ؛ لار و گێڕ ▣ کج و کوله

**چەپوچیڕ** / çep û çîř/: ئاوەڵناو. خوار و نالەبار ▣ کج و مُعوج

**چەپوخاڵ** / çep û xał/: ناو. چەپوغان؛ کار بە دزییەوە؛ کاری پەنامەکی ▣ کار پنهانی

**چەپوڕاس** / çep û řas/: ☜ چەپوڕاست

**چەپوڕاست**[1] / çep û řast/: ناو. چەپوڕاس؛ خاچ؛ چەلیپا ▣ صلیب

⊡ **چەپوڕاست کردن**: دەستی ڕاست و لاقی چەپ درێژ کردن یان بە پێچەوانەوە ▣ دراز کردن دست و پای مخالف

**چەپوڕاست**[2]: ئاوەڵکار. چەپوڕاس؛ لە چەپ و ڕاستەوە ‹چەپوڕاست تێ سرەواند› ▣ از چپ و راست

**چەپوغان** / çepuğan/: ☜ چەپوخاڵ

**چەپوگوپ** / çep û gup/: ناو. ڕاوەڕووت ▣ راهزنی

**چەپۆ** / çepo/: ناو. چەپاو؛ چەپڵاو؛ پویر؛ پوور؛ تالان ▣ چپاول

**چەپۆش** / çepoş/: ناو. گیسکە مێ ▣ بُزغالەی مادینه

**چەپۆق** / çepoq/: ناو. لوولەی سەبیلە ▣ دستەی پیپ

**چەپۆک** / çepok/: ناو. چەپووک؛ چەپەڵۆک؛ چەمەڵۆکە: ١. پانایی لەپی دەست ٢. کاری بە پانایی لەپ بە تەوقی سەردا دان ▣ ١. کف دست ٢. توسری

**چەپۆکان** / çepokan/: ناو. کاری لە سەر پاشوو هەڵسانی ئەسپ و هار و هاجی کردن ▣ چراغپا؛

ڕوی دست بلند شدن و چموشی کردن اسب

**چەپۆکەسەر / çepokeser/:** ئاوەڵناو. [پەلار] ژێرچەپۆکە؛ بندەست؛ چەوساوە. هەروەها: **چەپۆکەسەری** ☰ تحت سُلطه

**چەپۆڵە / çepołe/:** ناو. ١. دەستی چکۆڵەی منداڵ ٢. پەنجەی بێچوەپشی و ... ☰ ١. دست کودک ٢. پنجەی بچەگربه و ...

⊡ **چەپۆڵە دادان:** هەڵتووتەکانی ڕێوی و گەماڵ و ... ☰ چمباتمه نشستن سگ و روباه و ...

**چەپۆڵەشێرە / çepołeşêre/:** ناو. گیایەکە لە پەنجەی پشیلە دەکا ☰ گیاهی است

**چەپووک / çepûk/:** ☜ **چەپۆک**

**چەپووکان / çepûkan/:** ناو. دۆخی قولەقوڵ کردن و کولان ☰ غُل ـ غُل

⊡ **چەپووکان کردن:** ١. کولان و لە دۆخی قولەقولدا بوون ‹سەماوەرەکە چەپووکان ئەکا› ٢. [کینایە] زۆر قەڵس بوون و بە سەر و گوێلاکی خۆدا دان ‹لەو ڕۆژەو ئەم خەوەریە ژنەفتگە چەپووکان ئەکا› ☰ ١. غل ـ غل زدن ٢. از عصبانیّت بر سر و روی خود زدن

**چەپە[1] / çepe/:** ناو. ١. چەپکەگیا ٢. دەسبەندی یەکسم ٣. سەوڵی بەلەم لێخوڕین ☰ ١. دستەی گیاه ٢. دستبند آهنین ستور ٣. پاروی قایقرانی

**چەپە[2]:** ئاوەڵناو. ١. چەپلەر؛ فێرەکار بە دەستی چەپ ٢. لار و بە پێچ و پەنا ٣. هەڵگەڕاوە (بۆ ماشین و ...). هەروەها: **چەپە بوون؛ چەپە کردن** ☰ ١. چپدست ٢. کج و مُعوج ٣. چپه

**چەپەترووک / çepet(i)rûk/:** ناو. گیایەکە لە برۆێش دەکا و لە ناو گەنمدا دەڕوێ ☰ گیاهی است

**چەپەجاخ / çepecax/:** ناو. چەپەجاغ؛ چەپەچاخ؛ جەخار؛ شەتیر؛ ساتوور؛ کاردێکی دەمپان و قورس بۆ شکاندنی ئێسک و قرتاندنی گۆشت و جنینی سەوزی ☰ ساطور

**چەپەجاغ / çepecağ/:** ☜ **چەپەجاخ**

**چەپەچاخ / çepeçax/:** ☜ **چەپەچاخ**

**چەپەر / çeper/:** ناو. ١. تامان؛ دەرگا و دیواری لە شووڵ ‹چەپەرە شرە چ پێوە بێ، چ لێوە بێ «مەسەل»› ٢. تەتەر؛ نامەبەر ‹نامە دان بە دەست شازادە کەیان/ چەپەر قەتار دا وە تەعجیل دەوان «*شانامەی کوردی*»› ٣. مەتەرێز؛ سپێر؛ خەڵ؛ سەنگەر ☰ ١. پرچین ٢. پستچی ٣. سنگر

**چەپەربەن / çeperben/:** ناو. ملپێچ ☰ شال‌گردن

**چەپەربەندان / çeperbendan/:** ناو. کار و ڕەوتی کۆ بوونەوەی بە کۆمەڵ؛ لێک‌خڕ بوونەوە ☰ گردهمایی

**چەپەرچی / çeperçî/:** ناو. پۆستچی؛ پۆسەچی ☰ پُستچی

**چەپەرخانە / çeperxane/:** ناو. پۆستخانە ☰ پُستخانە

**چەپەک[1] / çepek/:** ناو. ١. دیوی پەنامەکی و لە کەنارەوە ‹زاخەکەی ئێمە چەپەکی هەیە› ٢. جۆگەی بە خواری لە تەختە مەرزەی بڵند و نەویدا ☰ ١. اتاق کناری ٢. جوی پر پیچ و خم در شالیزار ناهموار

**چەپەک[2]:** ئاوەڵناو. ١. دوور لە ڕێبازی گشتی ‹ئاخری پایز مەڕ و بزنێ لەڕ/ چوونە چیایێکی چەپەک بۆ لەوەڕ «حەقیقی»› ٢. بە پێچ و قەمچ؛ ناڕاستەوخۆ ‹ماڵەکەیان زۆر چەپەکە، هەر نایدۆزمەوە› ☰ ١. دور از جاده ٢. دشواریاب

**چەپەلووش / çepelûş/:** ناو. هەڵمەقووت ☰ بلع

**چەپەڵ / çepeł/:** ئاوەڵناو. ١. گەمار؛ پیس؛ چڵکن ٢. گنخاو؛ گەنیو ٣. [پلار] گەن؛ خراپ؛ بەدفەڕ ☰ ١. کثیف ٢. گندیده ٣. بدخو

**چەپەڵخوەر / çepełx(i)wer/:** ئاوەڵناو. نشمی؛ دژخۆر ☰ کثیف در غذا خوردن

**چەپەڵکاری / çepełkarî/**: ناو. گەنەکاری ☰ گُەکاری

**چەپەڵنای / çepełnay/**: چاوگ. پیس کردن ☰ آلودن

**چەپەڵۆک / çepełok/**: ☜ **چەپۆک**

**چەپەڵی / çepełî/**: ناو. ١. پیسی؛ ناتەمیسی؛ ناخاوێنی ٢. */مەجاز/* بەدفەڕی و بێئاکاری ٣. */کینایە/* پیسی؛ پیسایی؛ گوو ☰ ١. کثافت ٢. پستی ٣. مدفوع

**چەپەڵیای / çepełyay/**: چاوگ. پیس بوون ☰ آلوده بودن/ شدن

**چەپەن / çepen/**: ناو. لای چەپ ☰ چپ

**چەپەنداز / çependaz/**: ئاوەڵناو. دەغەڵ ☰ حیلەگر

**چەپەنگ / çepeng/**: ناو. لای چۆپەی لەشکر لە مەیداندا ☰ میسرەی لشکر

**چەپەوانە**[1] **/ çepewane/**: ئاوەڵناو. پێچەوانە؛ تەرسە ‹نووسینی چەپەوانە› ☰ چپکی

**چەپەوانە**[2]: ئاوەڵکار. پێچەوانە؛ تەرسە ‹چەپەوانە دەنووسێ› ☰ چپکی

**چەپی / çepî/**: ناو. ١. چۆپی؛ دیلان؛ هەڵپەڕکێ ٢. جۆرێ هەڵپەڕکێی کرژ ☰ ١. رقص گروهی کردی ٢. نوعی رقص

**چەپیش / çepîş/**: ناو. گیسک؛ بێچووی بزن لە پێنج مانگەوە تا دەبێتە یەکساڵان ☰ چپش

**چەپیل / çepîl/**: ☜ **چۆپە**[2]

**چەپیوان / çepîwan/**: ئاوەڵناو. نابەجێ؛ بەراوەژوو ☰ برعکس

**چەپیوانە**[1] **/ çepîwane/**: ئاوەڵناو. بەراوەژوو ‹کاری چەپیوانە مەکە با تێدا دانەمێنی!› ☰ نابجا و نادرست

**چەپیوانە**[2]: ئاوەڵکار. پێچەوانە ‹کراسەکەت چەپیوانە کردووتە بەر!› ☰ وارونه

**چەپیە / çepye/**: ☜ **چەتفە**

**چەپێل / çepêl/**: ☜ **چۆپە**[2]

**چەپێڵ / çepêł/**: ☜ **چۆپە**[2]

**چەت / çet/**: ناو. ١. کوێزر؛ کۆزەر؛ چەولووک؛ هێشووی گەنم یان جۆی لە خەرماندا نەشکاو ٢. لەمپەر؛ بەرهەڵست ☰ ١. کوزل ٢. مانع

▣ **چەت تێخستن**: */کینایە/* کار تێکدان؛ چوکلەشکێنی کارێک کردن؛ بەرد خستنە ڕێ کارێ؛ قۆرت دە کارێ خستن ☰ چوب لای چرخ گذاشتن

**چەت تێکەوتن**: قۆرت تێکەوتن؛ گیر کردنی کار ☰ گیر در کار افتادن

**چەتارە / çetare/**: ناو. پارچەی ئاوریشم ☰ پارچەی ابریشمی

**چەتال / çetal/**: ☜ **چنگاڵ ـ٣**

**چەتاڵ / çetał/**: ناو. چەتەڵ: ١. دار یان ئاسنی دوولک کە بۆ تفەنگ لە سەر دانانی دەچەقێنن ‹مەگرتێ شنۆی هەناسەت بێدەنگ/ دووحاچەی چەتاڵ مەنیای نە ڕووی سەنگ «مەولەوی»› ٢. خێوەتی پچووک ٣. کۆی خەرمانی سوور ٤. چەنگالی لای کەوچک ☰ ١. چوب یا فلز دو شاخەی تکیەگاه تُفنگ ٢. خیمەی کوچک ٣. تودەی خرمن ٤. چنگال غذاخوری

**چەتاڵانە / çetałane/**: ناو. بەشی سەرکار لە کۆی خەرمانی سوور ☰ سهمی از خرمن گندم کە بە کدخدا می‌رسد

**چەتان / çetan/**: ناو. ١. دار و حەسیر لە دەورەی بانی عارەبانە بۆ کاکێشان ٢. سەرپۆشی لە قوماش بۆ عارەبانە و کالیسکە ☰ ١. دیوارەی اطراف گاری کە از نی یا چوب ساختە می‌شود ٢. چادر کالسکە و ارابە

**چەتاندن / çetandin/**: چاوگ. قرتاندن؛ قت کردن ☰ قطع کردن

**چەتاوەڕۆ / çetaweřo/**: ☜ **چەقاوەسو**

**چەتاوەسو / çetawesû/**: ☜ **چەقاوەسو**

**چـەتایی / çetayî/**: نـاو. ١. گـوش؛ هـەودا و ڕیشاڵەی لاسکی جۆرێ کەنەف کە دە ئاو و هەوای شۆداری گەرمیانـدا دەڕوێ و گـوێنی لێدەچنن ٢. پارچەی چنراو بەو هەودایە، بۆ گوێنی و جۆرێ مووکیت ☰ ١و٢. چتایی

**چەتر / çetr/**: ناو. ١. سـەیوان؛ کەرسـتەیەکە کـە جنسـەکەی ئـاو دانـادا و بـە چـەن تەلـەوە لـە میلەیەکدا ڕاگیراوە، بۆ بەرگری لـە دادانی بـاران، تاو و ... ٢. پاڕاشووت؛ پەڕەشووت؛ کەرستەیەکی وا بـە پێکهاتەیـەکی سـووکتر و پتـەوترەوە بـۆ داپەڕین لە فڕۆکە و بەرزاییەوە ☰ ١. چتر ٢. چتر نجات

⊡ **چەتر کردن**: چەتر هەڵدان: ١. خۆ فش کـردن و کلـک ڕەپ کـردنی تـاوس و قەلەموونـە ٢. هەڵپەرتاوتنی دار بۆ جـوانی ☰ ١. چتر کـردن طاووس و بوقلمون ٢. هرس کـردن شاخ و بـرگ درخت

**چەتر هەڵدان**: ☜ **چەتر کردن**

**چەترباز / çetrbaz/**: ناو. پەڕاشۆتڤان؛ ئـەوەی بـە چەتر لە بەرزایی یا فڕۆکەوە دادەپەڕێ ☰ چترباز

**چەترمە / çetirme/**: ☜ **چۆرتم ـ٢**

**چەترەقی / çetreqî/**: ناو. جـۆرێ کـولێرەی سـەر ساج ☰ نوعی گردەی ساجی

**چەتفە / çetfe/**: ناو. چەپیـە؛ چەفیـە؛ دەسماڵـی سەری عارەبان کە عەگالی بە سـەردا دەبەسـتن ☰ چفیه

**چەتلەمەر / çetlemer/**: ناوەڵناو. ١. دەسبڕ و فێڵباز ٢. نەزان و سەرڕەق ☰ ١. شیّاد ٢. نادان و کلّەشق

**چەتن / çetin/**: ☜ **چەتون**

**چەتوەل / çetwel/**: ناو. ١. یەکەی کێشانەی کۆن بەرامبەر بە ١٢٥ گـرەم ٢. یەکـەی پێـوانی تـراو (بەتایبەت ئەلکولی) بەرانبەر بە ١٢٥ میلی لیتـر ☰ ١و٢. چَتول

**چەتۆر / çetor/**: ناو. ١. لە چوار بەش بەشـێک ٢. پارەیەکی سـەردەمی عوسمـانی ٣. دەمـەتیخی کول و ژەنگاوی ☰ ١. یـک چهـارم ٢. از واحـدهای پول عثمانی ٣. تیغ کُند و زنگ‌زده

**چەتـوور / çetûr/**: جێنـاو. فـلانی؛ کـابرا؛ کـاورا ☰ فلانی

**چەتـوون / çetûn/**: ناوەڵـناو. چــەتن؛ چــەتین: ١. سەخڵەت؛ زەحمەت ‹لە کاری چەتوون کێ یاریـت دەکا/ کێ لە ڕاست دوژمن داشداریت دەکـا «هـەژار، *ئاڵەکۆک*»› ٢. نەگونجاو؛ بەدڕەوشـت؛ تـووش ٣. بزۆز و هەدانەدەر ‹منالی چەتوون› ☰ ١. دشـوار ٢. بدقلق ٣. ناآرام

**چەتـوونی / çetûnî/**: نـاو. دژواری؛ سـەختی ☰ دشواری

**چەتـە[1] / çete/**: نـاو. ١. ڕێگـر؛ ڕێگـیر؛ سـەرڕێگر؛ دەڕێ‌گر؛ ڕێبـڕ؛ ڕێـژەن؛ ڕابـڕ؛ بـەیگر؛ هەڕۆکـە؛ گۆران؛ کەلەشە؛ کەلەشەی؛ کەلیشـۆ؛ هایـدووت؛ سەرملەگیر؛ ملەزەن؛ دزگەردەنە؛ تەیرە؛ تەریـدە؛ تەریە؛ تەریرە؛ جەردە؛ قەرەپشی؛ کەسێ کـە لـە دەرەوەی شاران بە زۆرەملی ڕێبواران ڕادەگرێ و پارە و پیتەوایان بە تالان دەبا ‹تۆ لەو دیو تەپە من لەم دیو تەپە/ تۆ بووی وە شاخ و مـن بـووم وە چەتـە «فولکلـۆر»› ٢. *[پـلار]* جەندرمـە ☰ ١. راهـزن ٢. ژاندارم

**چەتە[2]**: ناوەڵناو. هاوبەش لە شۆڕشی دژی دەوڵەت ☰ شورشی

**چەتـەبرژێن / çetebirjên/**: ناوەڵـناو. نیوەکـوڵ ☰ نیم‌پخته

**چەتەڕێ / çeteřê/**: ناو. کوێرەڕێ ☰ کوره‌راه

**چەتـەگەری / çetegerî/**: نـاو. چەتەیی؛ جـەردەیی؛ کەلەشەیی؛ کاری چەتە ☰ راهزنی

**چەتەڵ / çeteł/**: ☜ **چەتاڵ**

**چەتەوڵ** / çetewił/: ناو. پاسەوان ☲ پاسبان

**چەتەیی** / çeteyî/: ☜ **چەتەگەری**

**چەتیان** / çetyan/: ناو. دەرزیلە ☲ سنجاق‌قُفلی

**چەتیم** / çetîm/: ☜ **چەتیو**

**چەتین** / çetîn/: ☜ **چەتوون**

**چەتیو** / çetîw/: ناو. *[پلار]* چەتیم: ١. *[سووکەڵە]* کچەتیو؛ کچە هەتیو ٢. جوێنێ بۆ ژنان ☲ ١. دخترک بی‌سروپا ٢. کلمەی اهانت به زنان

**چەتیوە** / çetîwe/: ناو. *[پلار]* ژنی بەدناکار ☲ زن بدرفتار

**چەچ** / çeç/: ☜ **چەچە**[1]

**چەچڵە** / çeçłe/: ☜ **چەچە**[1]

**چەچول** / çeçul/: ناو. لە گەمەی هەلووکێندا هەر کەس هەلووک وە دەستی کەوێ نەیدۆڕاندووە، بەوە دەڵێن «چەچول»، هێندێ بڕیار ئەدەن وە هەر کوێی بکەوێ «چەچول»ـە ☲ اصطلاحی در بازی الک دولک

**چەچە**[1] / çeçe/: ناو. *[منداڵانە]* چەچ؛ چەچڵە؛ چەچەکە؛ دەستی چکۆلە ☲ دست کوچولو

**چە . چە**[2]: دەنگەناو. وشەیێ بۆ لێخوڕینی هێستر و قاتر و... ☲ کلمەی راندن مرکب

**چەچەقوڵە** / çeçequłe/: ☜ **چەچەکۆڵە**

**چەچەکۆڵە** / çeçekołe/: ناو. چەچەقوڵە؛ جۆرێ نەخۆشی حەیوانی بەرزە ☲ از بیماری‌های گاو و ستور

**چەچەکە** / çeçeke/: ☜ **چەچە**[1]

**چەخت** / çext/: ئاوەڵناو. ١. ڕژد و هەڵەمووت ٢. *[پلار]* بێشەرم و حەیا ☲ ١. مرتفع و دشوارگُذر ٢. بی‌شرم

**چەختی** / çextî/: ناو. چوختی: ١. کارامەیی؛ لێهاتوویی ٢. *[پلار]* بێشەرمی ☲ ١. کارآمدی ٢. بی‌شرمی

**چەخس** / çexs/: ناو. چین؛ چەسپ؛ جۆش؛ دەوریکی لێدان ‹چەخسێکی باشی کوتا!› ☲ فصل (کُتک‌کاری)

**چەخش** / çexş/: ناو. بەرژەوەندی ☲ مصلحت

**چەخماخ** / çexmax/: ناو. چەخماغ؛ چەقماق: ١. چەکوچ ئاسایەک لە تفەنگدا کە پاڵ بە دەرزییەوە دەنێ ٢. چەرخ؛ ئامرازی ئاگر پێکردن ‹نەی نەیخانەی تەن ئایر هۆرێزا/ بزیسکەی چەخماخ کام شەش خان خێزا «مەولەوی»› ☲ ١. چخماق تفنگ ٢. فندک

**چەخماخچی** / çexmaxçî/: ناو. تفەنگ‌ساز؛ وەستای تفەنگ چا کردنەوە ☲ اسلحەساز

**چەخماخچێتی** / çexmaxçêtî/: ☜ **چەخماخسازی**

**چەخماخسارم** / çexmaxsarim/: ناو. جۆرێک تفەنگی قەدیمی ☲ نوعی تفنگ قدیمی

**چەخماخسازی** / çexmaxsazî/: ناو. چەخماخچێتی؛ پیشە و سنعاتی تفەنگ‌سازی ☲ اسلحەسازی

**چەخماخە** / çexmaxe/: ناو. ١. بریقەی برووسکە ‹لە ژوور سەریەوە دەست و خەنجەری/ چەشنی چەخماخەی ئاسمان ئەلەری «گۆران»› ٢. کوچک چەخماخە؛ بەردی ئاگرهەڵایسێن ☲ ١. آذرخش ٢. سنگ آتشزنە

**چەخماغ** / çexmağ/: ☜ **چەخماخ**

**چەخموور**[1] / çexmûr/: ناو. چاخموور؛ ئەسپێ کە گلێنەی چاوێکی لەوی‌تر کاڵتر بێ ☲ چخمور

**چەخموور**[2]: ئاوەڵناو. چاخموور؛ پتەو ☲ مُحکم

**چەخوو** / çexû/: ☜ **چەقۆ**

**چەخەر** / çexer/: ناو. ١. نیشانەکاریی ڕێ و بان؛ کێلکا سەر ڕێکی ٢. شوێنگیری لە ڕێگەدا ☲ ١. نشانەگذاری مسیر ٢. ردیابی

**چەدان** / çedan/: ناو. شوێنی کۆ کردنەوە و لەتەرە دانی تووتن ☲ محل جمع‌آوری توتون

**چەدما** / çedma/: ئاوەڵکار. لە پاش ☲ پس از

**چەدەنە** / çedene/: ناو. ڕێحانەکێویلە ☲ ریحان

کوهی

**چەراخۆخ / çeraxox/:** ناو. بەشی ژوورەوەی سەر تەنوور و مەتبەق ⇆ قسمت بالای تنور و مطبخ

**چەراغی / çerağî/:** ئاوەڵناو. سەر بە خانەدانی گەورە ⇆ اشرافی

**چەراندن / çerandin/:** چاوگ. لەوەڕاندن ⇆ چراندن

**چەراوری / çerawrî/:** ناو. مەلێکی پچووکی وەک چۆلەکەیە ⇆ پرنده‌ای شبیه گنجشک

**چەرب / çerb/:** ☜ **چەقر**[2]

**چەربی / çerbî/:** ☜ **چەوری**

**چەرپا / çerpa/:** ناو. چارپا؛ چرپا؛ چرپایە؛ چارپایە؛ چارپل؛ چەرپایە؛ قەرەوێڵە؛ تەختی نووستن ‹بنوو لە سەر چەرپای ئالتوون/ لە تەلاری ڕەنگاوڕەنگت «کامەران موکری»› ⇆ تختخواب

**چەرپاندن / çerpandin/:** چاوگ. زللە لێدان ⇆ سیلی زدن

**چەرپایە / çerpaye/:** ☜ **چەرپا**

**چەرت**[1] **/ çert/:** ناو. سەتڵی گەورەی ئاو ⇆ سطل بزرگ آب

**چەرت**[2]: ئاوەڵناو. جیا؛ جودا ⇆ جدا

**چەرچەف / çerçef/:** ناو. مەلافە؛ ڕوودۆشەک و بالگە ⇆ ملافه

**چەرچی / çerçî/:** ناو. چارپێچی؛ چاریچی؛ چەمچی: ١. دێوەرە؛ دیڤەرە؛ کۆڵگەڕ؛ کۆڵگێڕ؛ پیلەوەر؛ گەڕیدە؛ مەترەبار؛ حەتار؛ دەسفرۆش؛ دەستفرۆش؛ بەخەڵفرۆش؛ وردەفرۆش؛ دەزگیر؛ دەستگێر؛ وردەواڵەفرۆش؛ مامەڵەچیی گەڕیدە کە شتومەک دەباتە لادێیان ٢. */کینایە/* سەوداگەری فێڵباز ⇆ ١. پیلەور ٢. بازاری شیّاد

**چەرخ / çerx/:** ناو. ١. پێچک؛ تەگەرە؛ لر؛ خڕ؛ بازنەئاسایێ کە لە سەر تەوەرەیەک هەڵدەسووڕێ ٢. */کینایە/* گەردوون؛ ڕۆژگار ‹های چەندە سەرچەنگ چەرخ چەپ وەردم/ چەرخ هەر چەرخیا و من مام، نەمەردم! «مەولەوی»› ٣. سەدە؛ سەد ساڵ ‹شەرەفخان تا سەرەتاکانی چەرخی ١١ی کۆچی ـ مانگی ژیاوە› ٤. ئامرازی ئاو هەڵکێشان لە بیر ٥. ئامرازی چەقۆ تیژ کردن ٦. چەخماخ؛ لایت؛ ئامرازی ئاگر پێکردن ٧. واشە؛ باشوو؛ سەقر؛ مەلێکی ڕاوکەرە ٨. کۆڕی هەڵپەڕکێ ⇆ ١. چرخ گاری و اتومبیل و ... ٢. گردون ٣. قرن ۴. چرخ چاه ۵. ابزار چاقو تیزکردن ۶. آتشزنه ۷. باشه ۸. حلقه‌ی رقص

▣ **چەرخی پایی:** ئامێرێکی چەرخدار کە بە پێیان کار دەکا، بەتایبەت چەرخی دروومان ⇆ چرخ پایی

**چەرخی دروومان:** ماکینەی جل دروون کە دەستی، پایی و بەرقیشی هەیە ⇆ چرخ خیاطی

**چەرخی گۆشت:** کەرەسەیەکی دەستی یان کارەباییە بۆ ورد و ئەنجن کردنی گۆشت ⇆ چرخ گوشت

▣ **چەرخ خواردن:** چەرخان ⇆ جرخیدن

**چەرخ دان:** ١. چەرخین؛ سووڕان ٢. چەرخاندن: سووڕاندن ⇆ ١. چرخیدن ٢. چرخانیدن

**چەرخ لە چەمبەر دان:** */کینایە/* چەرخ لە چەمەر کێشان؛ ئازار دان ⇆ شکنجه دادن

**چەرخ لە چەمەر کێشان:** ☜ **چەرخ لە چەمبەر دان**

**دانە چەرخ:** ☜ **لە چەرخ دان**

**کردنە چەرخ:** ☜ **لە چەرخ دان**

**لە چەرخ دان:** کردنە چەرخ؛ چەرخ کردن؛ دانە چەرخا؛ ورد کردن (بەتایبەت گۆشت) ⇆ چرخ کردن

**چەرخان**[1] **/ çerxan/:** چاوگ. تێنەپەڕ. //چەرخای؛ دەچەرخی؛ بچەرخێ// چەرخین؛ چەرخیان؛

سووڕدان؛ زڤرین ☰ چرخیدن
■ ئاوەڵناوی بەرکاری: چەرخاو/ چاوگی نەرێنی: نەچەرخان
**چەرخان**[۲]: ئاوەڵناو. بە تایبەتمەندی یان توانی سووڕانەوە ‹سەندەلی چەرخان› ☰ گِرد
**چەرخاندن** / çerxandin/: چاوگ. تێپەڕ. //چەرخاندت؛ دەچەرخێنی؛ بچەرخێنە// چەرخانن: ۱. سووڕاندن؛ زڤراندن ۲. بەڕێوە بردن ☰ ۱. چرخانیدن ۲. اداره کردن
■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەچەرخاندن
**چەرخانن** / çerxanin/: ☜ **چەرخاندن**
**چەرخکار** / çerxkar/: ناو. کەسێ کە بە چەرخی دروومان کار دەکا. هەروەها: **چەرخکاری** ☰ چرخکار
**چەرخکراو** / çerxk(i)raw/: ئاوەڵناو. ئەنجنراو بە چەرخ ‹گۆشتی چەرخکراو› ☰ چرخ‌کرده
**چەرخنای** / çerxnay/: چاوگ. چەرخاندن ☰ چرخاندن
**چەرخوفەلەک** / çerx û felek/: ناو. ۱. فڕۆکەی خەیاڵی ناو چیرۆکان ۲. گەردوونە؛ کەرەستەیەک بە ژمارەیەک کورسییەوە بۆ چەند کەس کە بە دەوری خولگەیەکدا هەڵدەسووڕێ و خەڵک بۆ خۆشی سواری دەبن ☰ ۱. هواپیمای افسانه‌ای قصه‌ها ۲. چرخ‌وفلک
**چەرخە** / çerxe/: ناو. ۱. سووڕ؛ سایکڵ؛ زنجیرەی لە شوێن یەکی دیاردەگەلی دووپاتەیی، لە خاڵێکەوە، تا دێتەوە سەر هەمان خاڵ (وەک: چەرخەی ژیان کە بریتییە لە: هاتنە دنیا، گەشە کردن، پێگەیشتن، پیر بوون و مردن) ۲. واشە؛ سەقر ☰ ۱. چرخه؛ سیکل ۲. قرقی
⊡ **چەرخە دان**: خول خواردن بە دەوری گڕی ئاگردا؛ سووڕدان لە دەوری ئاگر ☰ چرخیدن دور آتش
**چەرخە کردن**: ڕاکردن بە دەوری شتێکا؛ دەوراندەوور هەڵاتن ☰ دور چیزی چرخیدن
**چەرخەتوون** / çerxetûn/: ناو. سۆبا ☰ بُخاری
**چەرخەچی** / çerxeçî/: ناو. ۱. عەسەس؛ پاسەوانی شەو ۲. ئاوگەردان ☰ ۱. شبگرد ۲. آبگردان
**چەرخەک** / çerxek/: ناو. چەرخەکی؛ قرقرە؛ غەرغەرە؛ قرقرە؛ دارووکەی دەزوو لێ پێچان ☰ قرقره
**چەرخەکی** / çerxekî/: ☜ **چەرخەك**
**چەرخەمە** / çerxeme/: ناو. ۱. سەیوانی لە قامیش ۲. زەنبیلەی لە قامیش ☰ ۱. سایبان ساخته از نی ۲. زنبیل ساخته از نی
**چەرخی**[۱] / çerxî/: ناو. ۱. پووڵێکی قەدیم ۲. سکەی قەراخ گڕنی-گڕنی ۳. کاسەی چووکی مسی ☰ ۱. از پول‌های قدیمی ۲. سکەی کنگره‌ای ۳. کاسەی مسی
**چەرخی**[۲]: ئاوەڵناو. گرۆڤەر؛ خڕ ☰ گِرد
**چەرخیان** / çerx(i)yan/: ☜ **چەرخان**[۱]
**چەرخیای** / çerx(i)yay/: چاوگ. چەرخان ☰ چرخیدن
**چەرخین** / çerxîn/: ☜ **چەرخان**[۱]
**ـ چەرخێن** / çerxên/: پاشەوشە. خاوەن لێهاتوویی چەرخاندن ‹کارچەرخێن› ☰ ـ گردان
**چەرداخ** / çerdax/: ☜ **چارداغ**
**چەرداغ** / çerdağ/: ☜ **چارداغ**
**چەرداوەڕوو** / çerdaweřû/: ☜ **چارداوەڕوو**
**چەردە** / çerde/: ئاوەڵناو. ڕەشتاڵە؛ ئەسمەر ☰ سیەچردە
**چەرس** / çers/: ناو. گراس؛ ماکی سڕکەری وەبەرهاتوو لە شادانە ☰ چرس
**چەرغوو** / çerğû/: ناو. چەڵغوو؛ گەسکی لە شوولەدار ☰ جاروی ترکه‌ای
**چەرقوبەز** / çerqubez/: ناو. هەڵپەڕکێی دوو

دەسماڵەی دوو کەسی ☰ رقص دونفری

**چەرقین / çerqîn/**: چاوگ. سەرکۆنە کردن؛ بە سەردا هاتن ☰ نکوهیدن

**چەرم[1] / çerm/**: ناو. ئاڤار؛ خام؛ خار؛ گووێن؛ عیار؛ پەژەنگ؛ پێستی گیانەوەری چوارپێ یان خزۆک کە بۆ نەرم و پتەوتر بوونەوە خۆشە دەکرێ ☰ چرم

◘ **چەرمی ئاوەسوو:** ١. جۆرێکی قایمی چەرم کە بۆ کاڵە و پێتاو و... بە کار دێت ٢. *[کینایە]* مرۆی بێشەرم ٣. *[کینایە]* مرۆی خاوەن ئەزموون ☰ ١. چرم محکم و بادوام ٢. آدم بی‌شرم ٣. آدم باتجربه

◘ **چەرمی کەسێ دەق کردن:** *[کینایە]* کەسێ تەمێ کردن، بە لێدان ☰ کسی را تنبیه کردن

**چەرم[2]:** ناوەڵناو. چەور؛ دهون ☰ چرب

**چەرمپیس / çermpîs/**: ناوەڵناو. *[کینایە]* ڕژد؛ چکووس ☰ خسیس

**چەرمچی / çermçî/**: ☜ **چەرمخۆشکەر**

**چەرمخۆشکەر / çermxoşker/**: ناو. چەرمچی؛ دەباغ؛ دەباغچی؛ کەسێ پێستان دە هەلال دەنێ و خۆشەیان دەکا ☰ دبّاغ

**چەرمسی / çerm(i)sî/**: ناوەڵناو. سیس‌هەڵگەڕاو؛ ژاکاو؛ چرچ‌بوو ☰ چروکیده

**چەرمسین / çerm(i)sîn/**: چاوگ. چرچ و لۆچ بوون؛ سیس هەڵگەڕان ☰ چروکیدن

**چەرمقی / çerm(i)qî/**: ناوەڵناو. چرچ‌هەڵگەڕاو ☰ چروکیده

**چەرمقین / çerm(i)qîn/**: چاوگ. چرچ بوون؛ لۆچ تێکەوتن ☰ چروکیدن

**چەرمکاندن / çerm(i)kandin/**: چاوگ. لۆچ کردن؛ چیندار کردن ☰ چروک کردن

**چەرمگ[1] / çermig/**: ناو. چەرموو؛ چەرموگ؛ چەرمووگ؛ ڕەنگی سپی ☰ سفید

**چەرمگ[2]:** ناوەڵناو. چەرموو؛ چەرموگ؛ چەرمووگ؛ بە ڕەنگی سپی ‹کراس چەرمگ› ☰ سفید

**چەرمگسوور / çermigsûr/**: ناوەڵناو. گەوری ملەسوور (بۆ پەز) ☰ سفیدِ گردن قرمز (گوسفند)

**چەرمگەر / çermger/**: ناو. دەواخ؛ دەواغ؛ هەلال ☰ دبّاغ

**چەرمگی / çerm(i)gî/**: ناو. چەرموویی؛ سپیەتی؛ گەوری ☰ سفیدی

**چەرموگ / çermug/**: ☜ **چەرمگ**

**چەرموک / çermok/**: ناو. پارچە چەرمێکە دە کلکی تەشی دەخەن ☰ تکه چرم دوک

**چەرموو / çermû/**: ☜ **چەرمگ**

**چەرمووگ / çermûg/**: ☜ **چەرمگ**

**چەرموویی / çermûyî/**: ☜ **چەرمگی**

**چەرمە[1] / çerme/**: ناو. یەکسمی سپیکەلە ☰ مرکب سفید رنگ

**چەرمە[2]:** ناوەڵناو. ١. سپی؛ چەرمگ ٢. لەڕ و لاواز ☰ ١. سفید ٢. لاغرمُردنی

◘ **چەرمە لێکردن:** مۆڕ بردنەوە ‹هەر کە ئاغا چەرمەی لێدەکرد ڕۆحی دەچوو› ☰ ابرو در هم کشیدن

**چەرمەچەقاڵتە / çermeçeqałte/**: ناو. چەقاڵتە: ١. گۆشتی ڕەگاوی ٢. *[پلار]* ژنی پیری سینگ و لاق وە دەرخەر ☰ ١. گوشت پُر رگ و پی ٢. زن پیر لباس نامناسب پوش

**چەرمەژووری / çermejûrî/**: ناو. شەنگاڵ؛ شەنگار؛ پێکۆترە؛ گیایەکی دەرمانییە ☰ شنگار

**چەرمەسەرە / çermesere/**: ☜ **چەرمەسەرێ**

**چەرمەسەری / çermeserî/**: ☜ **چەرمەسەرێ**

**چەرمەسەرێ / çermeserê/**: ناو. چەرمەسەرە؛ چەرمەسەری؛ دەرد و ئازار و ڕەنجی زۆر ☰ رنج و سختی بسیار

**چەرمەسی / çermesî/**: ناو. مەیلەو چەرمگ؛

ئامالْسپی ﷼ مایل به سفید

**چەرمەڵ**[1] / çermeł/: ناو. چەرمیلە؛ شۆکە؛ دۆکەی میوە ﷼ سپیدک درخت و پالیز

**چەرمەڵ**[2]: ناوەڵناو. چەرمەلانە؛ چەرمەڵە؛ سپیکار ﷼ سپیدوَش

**چەرمەلانە** / çermełane/: ☜ **چەرمەڵ**[2]

**چەرمەڵە** / çermełe/: ☜ **چەرمەڵ**[2]

**چەرمی**[1] / çermî/: ناو. ۱. سپی؛ چەرموو ۲. چەوری ﷼ ۱. سفید ۲. چربی

**چەرمی**[2]: ناوەڵناو. ۱. سپی؛ چەرمگ ۲. دروستکراو لە چەرم یان بە شێوەی چەرم ﷼ ۱. سفید ۲. چرمی

**چەرمیلە** / çermîle/: ☜ **چەرمەڵ**[1]

**چەرمین** / çermîn/: ناوەڵناو. چەرمینە؛ دروستکراو لە چەرم ﷼ چرمی

**چەرمینە** / çermîne/: ☜ **چەرمین**

**چەرمێنە** / çermêne/: ناو. ۱. سپێنەی هێلکە ۲. سپێنەی چاو ﷼ ۱. سپیدەی تخم ۲. سفیدی چشم

**چەرنای** / çernay/: چاوگ. لەوەڕاندن ﷼ چراندن

**چەرننە** / çerinne/: ☜ **چەڕندە**

**چەروەدار** / çerwedar/: ☜ **چاروادار**

**چەروو** / çerû/: ☜ **چەور**[2]

**چەرە** / çere/: ناو. خواردەمەنی؛ خۆراک ﷼ خوراک

**چەرەخۆرە** / çerexore/: ناو. ۱. ئامرازێکە لە ئاسیاودا ۲. *[کینایە]* مرۆی زۆرخۆر ﷼ ۱. ابزاری در آسیاب ۲. آدم پُرخور

**چەرەز** / çerez/: ناو. چەرەس؛ شتی تررووکاندنی و کالکە بادام و پستە پێکەوە ‹... توخوا ئەم جارە کە کۆ دەبنەوە، چەرەز و میوەی سەر میزەکانیان هەموو وە لا نێن! ئێسک و پرووسکی ئەنفالەکانیان لە بەردەم دانێن! «پەشێو»› ﷼ آجیل

**چەرەس** / çeres/: ناو. ۱. ☜ **چەرەز** ۲. چەری؛ کاری باسوخ و دۆشاو کردنی بە هەرەوەز ﷼ ۱. ☜ **چەرەز** ۲. عمل شیره و باسلق ساختن گروهی

**چەرەگە** / çerege/: ناو. بەرچیغ؛ ئەو دارانەی بە پاڵ چیغەوە دەچەقن ﷼ چوبهای نگهدارندەی چیغ چادر

**چەری** / çerî/: ☜ **چەرەس-۲**

**چەرین** / çerîn/: چاوگ. لەوەڕان ﷼ چریدن

**چەرێ** / çerê/: ناو. برینگ؛ مقەستی مەڕ برینەوە ﷼ دوکارد

**چەڕ** / çeř/: ناو. ۱. لەقە؛ شەق ۲. لەوەڕ؛ چێری ﷼ ۱. لگد ۲. چَرا

**چەڕاگە** / çeřage/: ناو. چایەر؛ گیاجاڕ؛ جێ‌لەوەڕ ﷼ چراگاه

**چەڕان** / çeřan/: چاوگ. لەوەڕان ﷼ چریدن

**چەڕانن** / çeřanin/: چاوگ. لەوەڕاندن؛ ئاژەڵ بردنە دەشت بۆ گیا خواردن ﷼ چرانیدن

**چەڕخین** / çeřxîn/: چاوگ. خلیسکان؛ خزیان ﷼ لیز خوردن

**چەڕندە** / çeřinde/: ناوەڵناو. چەرننە؛ گیاخۆر؛ ئالفخۆر؛ بچەر؛ بە خوو یان تایبەتمەندی لەوەڕینەوە ﷼ چرندە

**چەڕوەشین** / çeřweşîn/: ناو. لووشکەهاوێژ؛ جووتەوەشێن ﷼ جُفتک‌انداز

**چەڕەدووکەڵ** / çeředûkeł/: ☜ **چڕەدووکەڵ**

**چەڕیان** / çeřyan/: ☜ **چەڕین-۱**

**چەڕین** / çeřîn/: چاوگ. ۱. چەڕیان؛ لەوەڕان؛ لەوەڕین ۲. گۆرانی گوتن ﷼ ۱. چریدن ۲. آواز خواندن

**- چەژ** / -çej/: پاشەوشە. ـ چێژ؛ مەزە؛ تام ‹خۆشچەژ› ﷼ - چش؛ طعم

**چەژتن** / çejtin/: ☜ **چەشتن**

**چەژگە** / çejge/: ☜ **چەشکە**

**چەژە** / çeje/: ☜ **چێژ**[1]

**- چەژی** / -çejî/: پاشەوشە. ـ چێژی ‹خوێ‌چەژی›

☚ ـ چشی

**چەس / çes/**: فعل. چییە ‹ئەم فرمدە چەس ڕەپییەو کەیدن؟/ ئـی ڕەوغەنـە چـەس لـە سـەرت دەیـدن؟ «ناهید»› ☚ چیست

**چەسپ[1] / çesp/**: ناو. ١. چەوس؛ زانقی؛ نووسـەک؛ ماکێ کە دوو شـت پێکـەوە دەلکێنـێ ٢. ڕەوتی لکان؛ پێوە نووسـان ٣. ☜ **چەخس** ☚ ١. چسب ٢. اتصال ٣. ☜ **چەخس**

⊡ **چەسپ کردن**: ١. پێکەوە نووساندن ٢. پێوە دان (بۆ پەنجەرە و هەر جۆرە درگایێ) ☚ ١. چسـباندن ٢. بر هم نهادن (در و پنجره)

**چەسپ لێدان**: ڕێزی نیزامی بە شێوەی پا جووت کردن و ڕەپ ڕاوەستان ☚ احترام نظامی گرفتن

▪ **چەسپ[2]**: پاشەوشە. ـگر ‹دڵـچەسپ› ☚ ـ چسب

**چەسپان[1] / çespan/**: چـاوگ. تێنەپـەڕ. //چەسـپای؛ دەچەسپێی؛ بچەسـپێ// لکان؛ نووسان؛ چەسـپیان ☚ چسبیدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: چەسـپاو/ چـاوگی نـەرێنی: نەچەسپان

**چەسپان[2]**: ئاوەڵناو. مەزبووت؛ لەش‌سووک ☚ چُست و چالاک

**چەسـپاندن / çespandin/**: چـــاوگ. تێـــەڕ. //چەسپاندت؛ دەچەسپێنی؛ بچەسپێنە// چەسپانن: ١. لکانـدن؛ نووسـاندن ٢. سـەلماندن ‹مێـژوو چەسپاندوویەتی کـە ئـازادی خـەلات ناکـەن› ☚ ١. چسباندن ٢. اثبات کردن

■ ئاوەڵـــناوی بـــەرکاری: ـــ/ چـــاوگی نـــەرێنی: نەچەسپاندن

**چەسپانن / çespanin/**: ☜ **چەسپاندن**

**چەسپاو / çespaw/**: ئاوەڵـناو. لکاو؛ مزەلـق؛ لکیـاو؛ لکیو ☚ چسبیده

**چەسـپنای / çespnay/**: چـاوگ. چەســـپاندن ☚ چسباندن

**چەسـپەڵـۆک / çespełok/**: نــاو. دەمووکانـــە؛ کشمیشی کاولیان ☚ دارواش

**چەسپیان / çesp(i)yan/**: ☜ **چەسپین**

**چەسـپیای / çesp(i)yay/**: چـاوگ. چەســـپان ☚ چسبیدن

**چەسپین / çespîn/**: چـاوگ. تێنەپـەڕ. //چەسـپیت؛ دەچەسـپی؛ بچەسـپە// چەسـپیان؛ لکـان؛ پێوەنووسان؛ نووسان ☚ چسبیدن

■ ئاوەڵناوی بـەرکاری: چەسـپیو/ چاوگی نـەرێنی: نەچەسپین

▪ **چەسپێن / -çespên/**: پاشەوشە. خاوەن لێهـاتوویی چەسپاندن ‹قوپچەچەسپێن› ☚ چسباننده

**چەسپێندران / çespênd(i)ran/**: ☜ **چەسپێنران**

**چەسپێنران / çespênran/**: چـاوگ. تێنەپـەڕ. نادیـار. //چەسـپێنرای؛ دەچەسـپێنرێی؛ بچەسـپێنرێ// چەسـپێندران؛ کەوتنـە بـەر چەسـپاندنەوە ☚ چسبانده شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: چەسپێنراو/ چاوگی نـەرێنی: نەچەسپێنران

**چەسپێنراو / çespênraw/**: ئاوەڵـناو. زامـق‌کـەردە؛ لکێندراو ☚ چسبانده شده

**چەسە / çese/**: فعل. چـەس؛ چییـە ‹دی چەسـە وەک بورج زەهرمار هاتییە سەرم؟› ☚ چیست

**چەش[1] / çeş/**: ناو. ١. چـاو؛ دیـە؛ دیـدە؛ چـەم ٢. ☜ **چێژ[1]** ☚ ١. چشم ٢. ☜ **چێژ[1]**

⊡ **چەش کردن**: چەشە بە نێچیر دان ☚ چشتەخـور کردن شکار

**چەش[2]**: ئاوەڵناو. ١. چەشـتەخواردوو ‹بـازی ڕۆحـی چەش بە شیعر و ئەدەب/ بەلام شێوەی زووی عەجەم و عەرەب «گـۆران»› ٢. فێـرەڕاو ‹وێنـەی شـیعری چەش بنوێنە/ دلی دوژمن داخورپێنە! «گـۆران»› ☚ ١. چَشتەخور ٢. تعلیم دیده برای شکار

⊡ **چەش بـوون** ١. بوونە نێچیری چەشـتەخواردوو

٢. فێرەڕاو بوونی تاژی ☰ ١. چشتەخور شدن ٢. تعلیم دیدن تازی

**چەش کردن** تاژی فێرەڕاو کـردن ☰ تعلیم دادن تازی

▪ **چەش**[٢]: پاشەوشە. ـ چەژ؛ ـ چێژ ‹شیرن چـەش› ☰ ـ چش

**چەشای / çeşay/**: چاوگ. چەشتن ☰ چشیدن

**چەشت / çeşt/**: ئاوەڵناو. چەشـتەخۆر؛ چەشـەخۆر؛ چەشتەخواردوو ‹هێنـدەت پـارەی مفـت پـێ داوە چەشت بووە› ☰ چشتەخور

**چەشتن / çeştin/**: چـاوگ. تێـەپ. //چەشـتت؛ دەچێـژی؛ بچێـژە// چـەژتن؛ چاشـاندن؛ چێـژان؛ چێژتن؛ چێشتن چێـژە کـردن؛ مـێلاک کـردن؛ چەشکە کـردن؛ چەشـە کـردن: ١. تـام کـردن؛ شـتێ بـۆ زانـینی تـامی نانـە دەم ‹بیچەشـە بـزا خۆشە!› ٢. بە تامێک زانین ‹چەشتم سـوێر بـوو› ٣. *[مەجاز]* هێچانـدن؛ ئازمـان؛ ئـەزموون؛ تـاقی کردنەوە ‹چێژی هەژاری و دەسـکورتیم چەشـتووە› ☰ ١تا٣. چشیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەچەشتن

**چەشتە**[١] / **çeşte/**: نـاو. ئەو چێژە بۆ نێچیر دادەنرێ ☰ چشته

**چەشتە**[٢]: ئاوەڵناو. ١. چەشتە خـواردوو ٢. فێـرەڕاو ٣. *[پەلار]* فێری بەرتیل وەرگرتن (بۆ کاربەدەسـت) ☰ ١. چشتەخور ٢. تعلیمدیده بـرای شـکار ٣. عـادت کرده به رشوه گرفتن

⊡ **چەشتە بون** چەشە بوون: ١. چەشتەخۆر بوون ٢. فێرەڕاو بوون (تاژی) ☰ ١. چشتەخور شدن ٢. تعلیم شکار دیدن (تازی)

**چەشتەخواردو / çeştex(i)wardû/**: ☜ چەشت

**چەشتەخۆر / çeştexor/**: ☜ چەشت

**چەشتەخۆرە / çeştexore/**: ئاوەڵناو. چەشەخواردوو؛ چەشـــەخۆر؛ چێشـــتەخۆر؛ چێشـــتەخۆرە؛ چێشکەخواردوو؛ خووگرتوو بە وەرگرتنی شتێکی کەم لە دیتران ☰ چشتەخور

**چەشتەی / çeştey/**: چاوگ. چەشین ‹مـەزاق یەنـد تاڵـــی دووری تـــۆ چەشـــتەن/ هووناوەکـــەی دڵ سەرزەمین ڕەشتەن «مەولەوی»› ☰ چشیدن

**چەشچەڕە / çeşçeře/**: ئاوەڵناو. چاوترسێن؛ تـەمێ بوو ☰ تنبیه شده

**چەشخیز / çeşxîz/**: ئاوەڵناو. چاوحیز؛ چاوچلـێس ☰ نظرباز

**چەشدار / çeşdar/**: ئاوەڵناو. ١. چـاونێر؛ چـاوەڕوان ٢. چاوساغ ☰ ١. چشمانتظار ٢. بینا

**چەشڕێ / çeşřê/**: ئاوەڵـناو. چەمـــەڕا؛ چـــاوەڕێ؛ چاوەنۆڕ ☰ منتظر

**چەشزەخم / çeşzexm/**: نـاو. *[بـاوەڕی کـۆن]* ١. چـاوێنی؛ چـاوزار ٢. نووشـــتەی چـــاوزار ☰ ١. چشمزخم ٢. چشمارو

**چەششەنە / çeşşene/**: ناو. چەشوەنـە؛ هێمـا بـە چاو ☰ اشاره با چشم

**چەشکە / çeşke/**: نـاو. چەژگــە: ١. چەشـــتە ٢. هەناو؛ جەرگ و دڵ و ... ☰ ١. چشته ٢. احشا

⊡ **چەشکە کردن** چێشتن؛ چێژە کـردن؛ چێـژتن؛ تام کردن ‹دوو ڕۆژە چەشکەی نانم نەکردووە› ☰ چشیدن

**چەشمە / çeşme/**: ناو. کانی؛ چاوە؛ هانە؛ سەرچاوە ☰ چشمه

**چەشمەک / çeşmek/**: ☜ **چاویلکە ـ١**

**چەشمەنداز / çeşmendaz/**: نـاو. چەشمـــەنناز؛ بەرجەوەن؛ دیمەن؛ چاوگە؛ بەرچاو ☰ چشمانداز

**چەشمەنناز / çeşmennaz/**: ☜ **چەشمەنداز**

**چەشمیک / çeşmîk/**: ناو. پوودری دەرمانی چاو ☰ پودر داروی چشم

**چەشن / çeşn/**: نـاو. ١. جۆر؛ تەرز ٢. شێوە؛ شـێل ☰ ١. نوع ٢. شیوه

**چەشنی**[1] / çeşnî/: ناو. چاشنی؛ تەرەقە 🇮🇷 چاشنی

**چەشنی**[2]: ئامراز. وەکوو؛ جۆری ‹لە چەشنی گەرووی کەو/ کەوی دۆمی یەخسیری زیندانی داری «سوارە»› 🇮🇷 مانندِ

**چەشوڕی** / çeşuřî/: ناو. چاوڕوو؛ شەرم و حەیا 🇮🇷 شرم و حیا

**چەشوەڕێ** / çeşwerî/: ☜ **چاوەڕوان**

**چەشوەڕێ** / çeşwerê/: ناوەلناو. چاوەڕێ؛ چەوەڕی؛ چەمەڕا 🇮🇷 چشم‌براه

**چەشوەنە** / çeşwene/: ☜ **چەش شەنە**

**چەشە**[1] / çeşe/: ناو. ١. چەشتە ٢. وردە خواردنی بەر لە نان و چێشت 🇮🇷 ١. چشته ٢. پیش‌غذا

▣ **چەشە بون**: ☜ **چەشتە بون**

**چەشە کردن**: ١. چێژە کردن ٢. چەشتە بە نێچیر دان 🇮🇷 ١. چشیدن ٢. چشته‌خور کردن شکار

**چەشە**[2]: ناوەلناو. چەشتەخواردوو ‹لوورە و وڕەی گورگی چەشە/ شەویار بەوە کەیفی خۆشە! «سوارە»› 🇮🇷 چشته‌خور

**چەشەخواردو**/ çeşex(i)wardû/: ☜ **چەشتەخۆرە**

**چەشەخۆر** / çeşexor/: ☜ **چەشتەخۆرە**

• **چەشی** / -çeşî/: پاشەوشە. ـ چەژی؛ ـ چێژی 🇮🇷 ـ چِشی

**چەشین** / çeşîn/: چاوگ. چەشتەی 🇮🇷 چشیدن

**چەعفک** / çe'fik/: ☜ **چاویلکە ـ١**

**چەعڤ** / çe'v/: ناو. چاو؛ چەم؛ دیە 🇮🇷 چشم

**چەعڤک** / çe'vik/: ☜ **چاویلکە ـ١**

**چەعڤنەبار** / çe'vnebar/: ناوەلناو. *[کینایە]* چاوچنۆک؛ چاوبرسی 🇮🇷 حریص

**چەفت**[1] / çeft/: ناو. چەفتەڕێز؛ ئالقەڕێزی دەرکە داخستن 🇮🇷 چفت

**چەفت**[2]: ناوەلناو. ١. خوار؛ لار؛ چەوت؛ چەوێل ‹هەر وەخت پەیش مەدیا وە نازی چەمان/ چەفت مەبی جە تاو موژەش، چوون کەمان «بێسارانی»› ٢. چەماوە؛ هەلگەڕاوە 🇮🇷 ١. کج ٢. برگشته

**چەفتلیس** / çeftlîs/: ناوەلناو. چلێس؛ نەوسن؛ سکن 🇮🇷 شکم‌پرست

**چەفتوبەس** / çeft û bes/: ناو. قولف و قەڕازە؛ ئامرازی بەستن وەک قولف، چەفت و ... 🇮🇷 چفت‌وبست

**چەفتوچەوێل** / çeft ûçewêl/: ☜ **چەوتوچەوێل**

**چەفتوچێل** / çeft û çêł/: ناوەلناو. لاروگێڕ 🇮🇷 کج و مُعوج

**چەفتور** / çeftûr/: ناوەلناو. چەفتول؛ شەفتوور؛ خواربڕاو؛ قیلەوقاچ 🇮🇷 اُریب

**چەفتول** / çeftûl/: ☜ **چەفتور**

**چەفتە** / çefte/: ناو. ١. بنەمێو کە لە دار دەهاڵێ ٢. بوختان و هەلبەستی درۆ ٣. چەتفە 🇮🇷 ١. رز به دور درخت پیچیده ٢. افترا ٣. دستار عربی

**چەفتەڕێز** / çefteřêz/: ☜ **چەفت**[1]

**چەفتەکەڵ** / çeftekeł/: ناو. چەوتەکەڵ؛ گای چوار سالە 🇮🇷 گاو نر چهار ساله

**چەفتەلی** / çeftelî/: ناو. ١. جۆرێ چارەکەی ژنان کە ڕاست و چەپ دەیپۆشن ٢. لاولاوەی دەرک و پەنجەرە 🇮🇷 ١. نوعی رودوشی زنانه که چپ و راست می‌پوشند ٢. لولای در و پنجره

**چەفتەوشێرە** / çeftewşêre/: ناوەلکار. چەپ و چیڕ بە خێلێکەوە ڕوانین 🇮🇷 چپ ـ چپ (نگاه کردن)

**چەفتی** / çeftî/: ناوەلناو. حازرجواو 🇮🇷 حاضرجواب

**چەفیە** / çefye/: ☜ **چەتفە**

**چەڤاندن** / çevandin/: چاوگ. ١. دە ناو یەک نان ٢. چەماندن؛ وەک کەوان هێنانەوە یەک ‹زۆربە وە تێتن عەرەب تێک چەڤاندن قەسەب/ قەنج ب چەهڤان مە دی جەنگ و جیدالا جەمەل «مەلای جزیری»› ٣. با دان ٤. *[مەجاز]* دەست ڕۆیشتن 🇮🇷 ١. در هم فرو بردن ٢. خم کردن ٣. تاباندن ۴. قدرت

داشتن

**چه‌ڤر**[1] / çevr/: ناو. گیایه‌كه گه‌لاده‌رزی له‌ جنسی كه‌ما و لۆ ☰ گیاهی است

**چه‌ڤر**[2]: ناوه‌ڵناو. چه‌ور؛ چه‌رب؛ دهون ☰ چرب

**چه‌ڤرچه‌ڤرۆك** / çevrçevrok/: ناو. گیایه‌كه‌ بنه‌كه‌ی بۆ خواردن ده‌شێ ☰ گیاهی با ریشه‌ی خوراكی

**چه‌ڤره‌بی** / çevrebî/: ناو. جۆرێك داره‌ بی ☰ نوعی بید

**چه‌ڤری** / çevrî/: ☜ چه‌وری

**چه‌ڤه‌ر** / çever/: ناو. دارێكی نێو قوپی و قه‌راغ ڕووبار ☰ درختی است

**چه‌ڤه‌نگ** / çeveng/: ناو. ئالا؛ عه‌له‌م ☰ پرچم

**چه‌ڤی** / çevî/: ناو. كووڕی؛ لاری ☰ خمیدگی

**چه‌ڤیان** / çevyan/: ☜ چه‌ڤین[1]

**چه‌ڤین**[1] / çevîn/: چاوگ. چه‌ڤیان؛ چه‌مین؛ چه‌مینه‌وه‌؛ خواره‌وه‌ بوون؛ داهاتنه‌وه‌ ☰ خمیدن

**چه‌ڤین**[2]: ناو. سه‌رچاوكه‌ ☰ چشمه

**چه‌ق**[1] / çeq/: ناو. ١. ورده‌ڕه‌گ ٢. ناوه‌ندی ڕێگه‌ ٣. ته‌وغی؛ كه‌ر هاتن؛ گزیر هاتنی میچ؛ چۆنیه‌تی چه‌قینی جگ له‌ سه‌ر لاقووڵه‌كه‌ی ٤. ناوه‌ڕاست ☰ ١. رگ و پی ٢. وسط راه ٣. گود افتادن شتالنگ ۴. مركز

◘ **چه‌قی مه‌رگ**: *[مه‌جاز]* به‌ هه‌زار حاڵ و كێشه‌كێش ☰ با زحمت بسیار

**چه‌قی نه‌حله‌ت**: *[مه‌جاز]* چۆنیه‌تی مان گرتن و ڕازی نه‌بوون ☰ لجاجت

◘ **چه‌ق به‌ستن**: *[كینایه‌]* خۆ گرتن و نه‌گۆڕان ☰ ثابت ماندن

**چه‌قی ڕه‌ش كردن**: *[مه‌جاز]* سوور بوون و پێداگری زۆر ☰ پافشاری كردن

**چه‌ق**[2]: ناوه‌ڵناو. ١. بێ‌بزووتن و به‌ پێوه‌ ‹به‌ڕاسی چه‌قه‌ كه‌س چاری ناكا!› ٢. سه‌رسه‌خت و لاسار له‌ سه‌ودادا ‹زۆر چه‌قه‌ و له‌و قیمه‌ته‌ نایه‌ته‌ خوار!› ٣. داشۆڕاو ‹سینه‌ی ڕه‌قم مه‌مكی چه‌قم!› ☰ ١. پایدار و سرسخت ٢. یكدنده‌ در مُعامله‌ ٣. شُل و افتاده‌؛ پلاسیده

**چه‌قاله** / çeqale/: ناو. چواله: ١. فه‌ریكه‌بادام ٢. ناوكه‌ قه‌یسی ٣. *[كینایه‌]* شه‌رمی ژن ☰ ١و٢. چغاله ٣. كنایه از اندام تناسلی زنان

◘ **چه‌قاله كێویله**: به‌رێ دارێكه‌ له‌ فه‌ریكه‌بادام ده‌كا ☰ بادام وحشی

**چه‌قاله‌بادام** / çeqalebadam/: ناو. حاجی‌بایف؛ حاجی‌بایف ☰ چغاله

**چه‌قاڵ** / çeqał/: پێرژ. ← به‌قاڵ و چه‌قاڵ

**چه‌قاڵته** / çeqałte/: ☜ چه‌رمه‌چه‌قاڵته

**چه‌قان**[1] / çeqan/: ☜ چه‌قین

- **چه‌قان**[2]: پاشه‌وشه‌. ـتكێن؛ تكێنه‌ری دڵۆپ ‹قه‌تره‌چه‌قان› ☰ ـ چكان

**چه‌قاندن** / çeqandin/: چاوگ. تێپه‌ڕ. //چه‌قاندت؛ ده‌چه‌قێنی؛ بچه‌قێنه// چه‌قانن: ١. نیان؛ ده‌زه‌ویدا ڕۆكردن ‹نه‌مام چه‌قاندن› ٢. تێ‌ڕۆ كردن ‹ئه‌و گولله‌یه‌ی ته‌قاندت، به‌ دڵ منا چه‌قاندت/ ئه‌گه‌ر بتدایه‌ به‌ گۆشت، گۆشتی زۆرتری ئه‌كرد بۆت! «قانع»› ☰ ١. نشاندن ٢. فروبردن

■ ناوه‌ڵناوی به‌ركاری: ـ/ چاوگی نه‌رێنی: نه‌چه‌قاندن

**چه‌قانن** / çeqanin/: ☜ چه‌قاندن

**چه‌قانه** / çeqane/: ناو. چه‌قه‌نه: ١. دوو پارچه‌ زه‌ردی چكۆله‌ی پانكه‌له‌ كه‌ سه‌ماكار ده‌ دوو قامكی ده‌كا و ده‌یانته‌قێنێ ‹مه‌جلیس پوڕ موتریب پوڕ چه‌قانه‌ و چه‌نگ/ پوڕ جه‌ ڕه‌ققاسان شه‌یدای شۆخ و شه‌نگ «خانای قوبادی»› ٢. ☜ چه‌قوونه ☰ ١. چغانه ٢. ☜ چه‌قوونه

**چه‌قانه‌ژه‌ن** / çeqanejen/: ناو. كه‌سێ كه‌ چه‌قه‌نه‌ لێ‌ده‌دا ☰ چغانه‌زن

**چه‌قاو** / çeqaw/: ناوه‌ڵناو. چه‌قی؛ چه‌قیو: ١.

ڕۆکراو ۲. [کنایە] وێستاوی بێجوولە ☰ ۱. در زمین فروشده ۲. بی‌حرکت ایستاده

**چەقاوەسو / çeqawesû/**: ناوەلناو. چەتاوەڕۆ؛ چەتاوەسوو؛ خووگرتوو بە خراپە؛ بێشەرم و بە چەقە و شلتاغ ☰ شارلاتان

**چەقای / çeqay/**: چاوگ. چەقان؛ چەقیان ☰ فرورفتن

**چەقچەچۆک / çeqçeçok/**: ناو. کاسنی؛ چەقچەقە؛ ئالفەگیایەکی لک باریکی گەلا بلاوی گوڵ ئاوی یان سپییە و هەمووی دەرمانە ☰ کاسنی

**چەقچەق / çeqçeq/**: ناو. ۱. قەزوانی سوێرکراوی لە ئاودا کوڵاو بۆ تروکاندن ۲. ☜ **چەقچەقۆک** ☰ ۱. پستەکوهی بو دادە ۲. ☜ **چەقچەقۆک**

**چەقچەقۆک / çeqçeqok/**: ناو. چەقچەق؛ چەقچەقە؛ چەقچەک؛ چەقەنە؛ چەقەنەی ئاش؛ دارێکە لە سەر بەردی سەرەوەی ئاشی ئاوی لەنگەر دەگرێ و هەڵبەز و دابەز دەکا و دەبێتە هۆی داڕژانی دانەکە ☰ وسیلەای در آسیاب آبی

**چەقچەقە / çeqçeqe/**: ناو. ۱. ☜ **چەقچەچۆک** ۲. گیایەکە شیرەی بنەکەی وەک بنێشت ئەجاون ۳. ☜ **چەقچەقۆک** ٤. مەکینەی خەیاتییە دەزووی پێوە دەکرێ و هەڵبەز- دابەز دەکا ٥. جۆرێ مەکینەی دروێنە کردن ☰ ۱. ☜ **چەقچەچۆک** ۲. گیاهی است ۳. ☜ **چەقچەقۆک** ۴. شیطانک چرخ خیاطی ۵. نوعی ماشین دروگر

**چەقچەک / çeqçek/**: ☜ **چەقچەقۆک**

**چەقرۆزە / çeqroze/**: ناو. گوڵێکە ☰ گلی است

**چەقرە / çeqre/**: ناو. بەش؛ شەقان؛ قەشقە؛ ئاژەڵی نێوچاوان سپی ☰ حیوان پیشانی سفید

**چەققە / çeqqe/**: ☜ **چەقە**[1]

▣ **بوونە چەققە**: هەرا هەستان؛ گەرم و قاڵ کەوتنەوە ‹بوو بە چەققە و شیرەشیرێک دەتگوت کاسەی قەرەچی ئاو بردوویە «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ سروصدا بلند شدن

**چەققەلۆ / çeqqelo/**: ناو. چەقەش؛ جۆرێ شنگی شاخییە، چەققەی لێدەگرن، گەلاکەی وەک لۆ وایە ☰ گیاهی است

**چەقڵ / çeqł/**: ناو. چوقڵ؛ دڕک؛ دڕوو ☰ خار

▣ **چەقڵ ماست**: ماستاو؛ ماساو؛ ئاوماس؛ ئاوەماست ☰ دوغ چربی نگرفته

**چەقڵانقۆچ / çeqłanqoç/**: ناو. قەزوان؛ کەسکان ☰ چاتلانقوش

**چەقڵە / çeqłe/**: ناوەلناو. چلکن؛ گەمار ☰ چرکین

**چەقماق / çeqmaq/**: ☜ **چەخماخ**

**چەقنای / çeqnay/**: چاوگ. چەقاندن ☰ نشاندن

**چەقوانە / çeqwane/**: ☜ **چەقوونە**

**چەقوتف / çeq û tif/**: ناو. چەقە و هەرا ‹بە هەزار چەق‌وتەف دەروێش بە نیو دینار ڕازی کرا و شلتاغی بە ئەفەندی نەما «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ چک‌وچانه

**چەقوچۆ / çeq û ço/**: ناو. چۆقە؛ لەرز ☰ لرز

**چەقولور / çeq û lûr/**: ناو. ۱. سەگوەڕ و لوورەلووری سەگان ۲. [کنایە] نەڕەنەڕە و هەرای زۆر ☰ ۱. صدای پارس و زوزەی چند سگ ۲. سر و صدای زیاد

**چەقولە / çequle/**: ناو. کێردی چکۆلە ☰ چاقوی کوچک

**چەقونە / çequne/**: ☜ **چەقوونە**

**چەقونێرە / çeq û nêre/**: ناو. زەنا ـ زەنا؛ دەنگ و قاڵی کاتی شەڕ ☰ همهمه

**چەقوە / çeqwe/**: ☜ **چەقۆ**

**چەقۆ / çeqo/**: ناو. چەقوو؛ چغۆ؛ چاقۆ؛ کارچوو؛ کاچوو؛ چەخوو؛ چەقوە؛ قەچۆ؛ ئامێرێکە بۆ برین، بریتی لە لێوارەیەکی تیژی کانزایی و دەسکێ کە بە سەریدا دەشکێتەوە ☰ چاقو

▣ **چەقۆ دەستەی خۆ نەبرین:** *[کینایە]* پێچەوانەی بەرژەوەندی خۆ یان کەس‌وکاری خۆ نەجوولانەوە 🇮🇷 خلاف مصلحت خود و اطرافیان کاری نکردن

**چەقۆ کێشان:** چەقۆ بە دەستەوە گرتن (بۆ هەڕەشە یان لێدانی کەسێک) 🇮🇷 چاقو کشیدن

**چەقۆ لە کەسێک دان و خوێنی دەرنەهاتن:** *[کینایە]* زۆر تووڕە بوونی کەسێک 🇮🇷 به شدت عصبانی شدن کسی

**چەقۆ لێدان:** کەسێک بە چەقۆ بریندار کردن 🇮🇷 چاقو زدن

**چەقۆی بێ دەستە دروست کردن:** *[کینایە]* ۱. سەری بێ دەلاک تاشین؛ کاری بێ سەرەنجام کردن ۲. وادەی پووچەڵ دان 🇮🇷 ۱. کار بی فرجام کردن ۲. وعدەی باطل دادن

**چەقۆتیژکەر / çeqotîjker/:** ناو. ۱. کەرستەی چەقۆ تیژ کردن ۲. کەسێ چەقۆ تیژ دەکا 🇮🇷 ۱و۲. چاقوتیزکن

**چەقۆساز / çeqosaz/:** ناو. چەقۆگەر؛ کێردکەر؛ وەستای دروست کردنی چەقۆ 🇮🇷 چاقوساز

**چەقۆکێش / çeqokêş/:** ناو. شەللاتی؛ کەسێ بە چەقۆ لێدان هەڕەشە لە خەڵک دەکا. هەروەها: **چەقۆکێشی** 🇮🇷 چاقوکش

**چەقۆگەر / çeqoger/:** ☜ **چەقۆساز**

**چەقوو / çeqû/:** ☜ **چەقۆ**

**چەقوونە / çeqûne/:** ناو. چەقوانە؛ چەقونە؛ چەقەنە؛ چەقانە؛ فنق؛ پل؛ پلێ؛ پتە؛ بستە؛ پل‌تەقێنە؛ تەقەتەق بە لێکدانی قامکە گەورە و بالابەرزە 🇮🇷 بشکن

**چەقە**[1] **/ çeqe/:** ناو. چەققە: ۱. شیلەی بنە شنگ کە ئەیجاون ۲. *[پلار]* چەنە؛ گوڕە و هەرا ۳. *[مەجاز]* پێداگری لە سەودادا 🇮🇷 ۱. قندران ۲. قیل‌وقال ۳. چانەزنی

▣ **چەقە کردن:** چەقەچەق کردن: ۱. *[پلار]* چەنە لێدان ۲. *[مەجاز]* پێداگری کردن لە مامەڵەدا 🇮🇷 ۱. وراجی کردن ۲. چانە زدن

**چەقە -**[2]**:** پێشوشە. ۱. چرە- (چەقەدووکەڵ) ۲. پەلە (چەقەساو) 🇮🇷 ۱. متراکم ۲. عجلە

**چەقەبی / çeqebî/:** ناو. دارەبی خۆڕست 🇮🇷 بید خودرو

**چەقەتە / çeqete/:** ئاوەڵناو. زۆربڵێ 🇮🇷 وراج

**چەقەچەق / çeqeçeq/:** ناو. *[پلار]* هەرا و هوریا؛ گاڵەگاڵ 🇮🇷 سروصدا

▣ **چەقەچەق کردن:** ☜ **چەقە کردن**

**چەقەچەناو / çeqeçenaw/:** ئاوەڵناو. *[پلار]* چەقەوهەراکەر؛ زۆربڵێ بە دەنگی بەرز 🇮🇷 پُرگوی بلندگوی

**چەقەخانە / çeqexane/:** ناو. *[پلار]* ژوورێک بە پەنا جێگەی نوێژەوە لە مزگەوت بۆ قسە کردن و بەڕێوە بردنی بۆنەکان 🇮🇷 اتاقی در کنار شبستان مسجد، برای بحث و اظهار نظر

**چەقەدووکەڵ / çeqedûkeł/:** ☜ **چڕەدووکەڵ**

**چەقەرە / çeqere/:** ☜ **چەکەرە -۱**

**چەقەڕۆ / çeqeřo/:** ناو. ۱. سەگوەڕ ۲. *[پلار]* هەرا و هوریا 🇮🇷 ۱. عو - عو ۲. همهمه

**چەقەساو / çeqesaw/:** ناو. ساوی بە پەلە 🇮🇷 عمل تیز کردن با عجله

**چەقەسرۆ / çeqes(i)ro/:** ئاوەڵناو. *[پلار]* زۆربڵێ؛ چەنەباز 🇮🇷 پرگو

**چەقەسرۆیی / çeqes(i)royî/:** ☜ **چەڵتەچەڵت**

**چەقەسوو / çeqesû/:** ئاوەڵناو. *[پلار]* چەقاوەسوو؛ بێ‌چاوڕوو 🇮🇷 بی‌شرم

**چەقەش / çeqeş/:** ناو. گیایەکە لە گیا کوڵکنە دەکا و چەققەی لێ‌دەگرن 🇮🇷 گیاهی است

**چەقەقاندن / çeqeqandin/:** چاوگ. *[پلار]* تەقەتەق کردن 🇮🇷 تق و توق کردن

**چەقەکەر** / çeqeker/: ناوەڵناو. ١. چەقەچەناو؛ زۆربلێ بە دەنگی بەرز ٢. لەسەر ڕۆ لە مامەڵەدا ☰ ١. پُرگوی بلندگوی ٢. دارای عادت به چانەزنی در معامله

**چەقەلۆ** / çeqelo/: ناو. گیایەکە لە لۆ دەکا، ساقەتەکەی زەردە، مالات دەیخوا ☰ گیاهی است

**چەقەڵ**[1] / çeqeł/: ناو. ١. تووری؛ تۆرک؛ گیاندارێکی گوانداری دڕندە و شەوڕۆیە وەکوو گورگ بەلام نەختێ بچووکترە و لە گۆشتی ڕاو، تۆپیو و برێ جار میوەیش دەخوا و زۆرتریش بە کۆمەڵ ڕاو دەکا ٢. پێچک؛ پێچکی کورسی ☰ ١. شغال ٢. پایەی صندلی

**چەقەڵ**[2]: ناوەڵناو. ١. *[پەلار]* لاواز؛ لەڕ ٢. مل ڕەشی ئەندام سپی (بزن) ☰ ١. لاغر ٢. سفیدِ گردن سیاه (بُز)

**چەقەڵاخ** / çeqełax/: ناو. کەمێڵەی ژێر دووگی مەڕ ☰ پوستاله؛ گال

**چەقەڵتە** / çeqełte/: ناوەڵناو. *[پەلار]* لەڕ؛ لاواز ☰ لاغر

**چەقەڵماست** / çeqełmast/: ناو. چالخەم؛ ماستاو ☰ دوغ چربی نگرفته

**چەقەن** / çeqen/: ناو. ڕەقەن؛ زەوی تمتم ☰ زمین سخت و سنگلاخی

**چەقەنە** / çeqene/: ناو. ١. چەقانە؛ پل ٢. دارێکی پنچکە ٣. ☜ **چەقچەقۆک** ٤. ☜ **چەقەوانە** ☰ ١. بشکن ٢. درختچەایست ٣. ☜ **چەقچەقۆک** ٤. ☜ **چەقەوانە**

**چەقەنەک** / çeqenek/: ناو. کاسنی؛ چەقەنە؛ چەقچەقە؛ چەقچەقۆک؛ چەکچەکیلە؛ هندووبا؛ گیاشیلاو؛ شیرەچاو؛ ئالفەگیایەکی گەلابلاوی گوڵ شین، سپی یان سوورکاڵە، بن و گەلا و گوڵ و تووەکەی دەرمانە ☰ کاسنی

**چەقەوانە** / çeqewane/: ناو. چەقەنە؛ چەقەنەی دەستی سەماکەر ☰ صنج

**چەقەوڕ** / çeqewiř/: ناو. چەکەوڕ؛ بۆنی ڕۆنی سووتاو ☰ بوی روغن سوخته

**چەقەوگوڕە** / çeq w guře/: ناو. جەنجاڵ؛ هەرا و هوریا؛ زەنا ـ زەنا ☰ جنجال

**چەقەوهەرا** / çeqe w hera/: ناو. *[پەلار]* گوڕە و چەقە؛ زەنا ـ زەنا؛ هەڵلا ـ هەڵلا ☰ هیاهو و جنجال

**چەقی** / çeqî/: ☜ **چەقاو**

**چەقیا** / çeqya/: ☜ **چەقیو ـ ١**

**چەقیان** / çeqyan/: ☜ **چەقین**

**چەقیای** / çeqyay/: چاوگ. چەقین ☰ فرورفتن

**چەقیلۆک** / çeqîlok/: ناو. ١. گوڵێکی سپی ڕەنگە ٢. چەقالە کێویلە ☰ ١. گلی سفیدرنگ ٢. چغالەی کوهی

**چەقیلە** / çeqîle/: ناو. جۆرێ خاشخاشک ☰ نوعی خشخاش کوهی

**چەقین** / çeqîn/: چاوگ. تێنەپەڕ. //چەقیت؛ دەچەقی؛ بچەقە// چەقان؛ چەقیان: ١. تێڕۆ چوون ‹هێند مونتەزیری تۆ بوو هەتا چاوی سپی بوو/ نەرگس کە لەسەر ڕێەک قەدەم و دیدە چەقیبوو «نالی»› ٢. *[کینایە]* گەیین و زەرد بوونی دەغڵ و دان و لە وادەی درووێنەیان تێپەڕین ☰ ١. فرورفتن ٢. از موسم درو و غلات سپری شدن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: چەقیو/ چاوگی نەرێنی: نەچەقین

**چەقینەوە** / çeqînewe/: چاوگ. دیسان چەقین ☰ باز فرورفتن

**چەقیو** / çeqîw/: ناوەڵناو. ١. چەقیا؛ ڕۆچوو ٢. گەیو و درووێنەنەکراو ☰ ١. فرو شده ٢. پیر شده و درو نشده (غلات)

**ـ چەقێن** / -çeqên/: پاشەوشە. خاوەن لێهاتوویی چەقاندن ‹پێ چەقێن› ☰ ـ کوب

**چەقێنران** / çeqênran/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار.

//چەقێنرای؛ دەچەقێنریی؛ بچەقێنریێ// ١. نریان؛ کێلیان ٢. ڕۆچوون ▤ ١. کاشته شدن ٢. فرورفتن
■ ئاوەڵناوی بەرکاری: چەقێنراو/ چاوگی نەرێنی: نەچەقێنران

**چەقێنراو** / çeqênraw/: ئاوەڵناو. نێژراو ▤ کاشته شده

**چەک**[1] / çek/: ناو. ١. ئامرازی جەنگ ٢. خشڵ؛ زەنبەر ٣. جلوبەرگ؛ پۆشاک ٤. شەپلاخە؛ چەپلاخە؛ زللە؛ شەقام؛ شەپەزللە ٥. نوالەی ئاوریشم ٦. چەرمی پاژنەی کلاش ٧. مشتەی دەستی هەلاج ٨. ئامرازی کار ٩. پسوولە؛ پەڕەیەکی چاپی کە ڕێ بە خاوەن حیسابی بانکی دەدات بۆ خۆی یان کەسێکی‌تر لە بانک پارە دەربێنێ ١٠. پینەی قەراغ بەری کەوش بۆ ڕاست کردنەوەی ▤ ١. جنگ‌افزار ٢. زیورآلات ٣. پوشاک ۴. سیلی ۵. گلولەی ابریشمی ۶. چرم پاشنەی گیوه ۷. مُشتەی پنبەزنی ۸ ابزار کار ۹. چک بانکی ١٠. پینەی کفش

▣ **چەکی بانکی**: پسوولەی وەرگرتنی پارە لە بانک ▤ چک بانکی

**چەکی سپی**: ١. چەکی واژۆکراو کە دەکرێ هەر بڕە پارەی تێدا بنووسی ٢. *[کنایه]* نامە، قسە یا هەر شتێ کە لە لایەن کەسێکەوە بە کەسێکی تر دەدرێ و تێیدا دەسەڵاتی تەواوی پێ دەردێت ▤ ١. چک سفید ٢. اختیار تام

⊡ **چەک دانان**: ١. دەست هەڵگرتن لە شەڕی چەکداری ٢. *[کنایه]* بەزین؛ ڕادەست بوون ▤ ١. سلاح بر زمین گذاشتن؛ متوقف کردن جنگ مُسلحانه ٢. تسلیم شدن

**چەک کردن**: چەکی شەڕ لێ‌ساندن ▤ خلع سلاح کردن

**چەک**[2]: ئاوەڵناو. ١. ڕووت و قووت ٢. لە بەر یەک چوو ‹کەوشەکانم چەک بووە› ▤ ١. لُخت و عور ٢. وارفته

**چەکاڵ** / çekał/: ناو. پێستی سیس و چرچی لەش کە لەرەی دێ ▤ پوست شُل و آویزان بدن

**چەکان** / çekan/: چاوگ. نەمانی شیر لە گواندا؛ چۆڕە لێبڕان ▤ نماندن شیر در پستان

**چەکاندن** / çekandin/: چاوگ. چەکانن؛ تا ئاخر دلۆپ مژین ▤ مُک زدن تا آخرین قطره

**چەکانن** / çekanin/: ☜ **چەکاندن**

**چەکبەند** / çekbend/: ناو. سەرکەوایەکی نیوە قۆلە تا سەر پشتێند ▤ بالاپوشی که بر قبا پوشند

**چەک‌پووش** / çekpûş/: ناو. ڕیزەوپێزە؛ خڕەوپڕە؛ وردی‌مردی ▤ خرت‌وپرت

**چەکچەکوولە** / çekçekûle/: ناو. شەمشەمەکوێرە ▤ خُفاش

**چەکچەکی** / çekçekî/: ناو. ١. شەمشەمەکوێرە ٢. قۆچەقانی؛ قەڵماسک ▤ ١. خُفاش ٢. فلاخن

**چەکچەکیلە** / çekçekîle/: ناو. ١. شەمشەمەکوێرە ٢. چەقچەچۆک؛ کاسنی ▤ ١. خفاش ٢. کاسنی

**چەکدار** / çekdar/: ئاوەڵناو. بە چەک؛ خاوەن ئەسپابی شەڕ ▤ مُسلح

**چەکدراو** / çekd(i)raw/: ناو. مەحکووم؛ ئەوەی لە دادگا بە تاوانبار دەرچووە ▤ محکوم

**چەکری** / çekrî/: ناو. ١. نێرتک؛ چەقەرە ٢. نێرتکەڕێواس ▤ ١. جوانه ٢. جوانەی ریواس

**چەکرێژ** / çekřêj/: ئاوەڵناو. پڕچەک؛ ساز و تەیار لە باری چەکدارییەوە ▤ مُسلح

**چەکساز** / çeksaz/: ناو. شیلانگەر ▤ اسلحەساز

**چەکسازی** / çeksazî/: ناو. جەخسی؛ شیلانگەری ▤ اسلحەسازی

**چەکسە** / çekse/: ☜ **سەگەزێ**

**چەکلێ** / çekłê/: ئاوەڵناو. ئالی؛ ژناخە ▤ زن‌ذلیل

**چەکمە**[1] / çekme/: ناو. جزمە؛ جەزمە؛ مانەگەزێ؛ ساپۆک؛ پۆستاڵ؛ پووت؛ گیزمە؛ کەوشی لاسک

دریژی تا ژێر ئەژنۆ (زیاتر پلاستیکی) ≡ چکمه

**چەکمە**[٢]: ئاوەڵناو. پێست داماڵاو ≡ پوست‌کنده

**چەکمەبۆر** / çekmebor/: ئاوەڵناو. [پەلار]

چەکمەڕەق: ١. کۆنەنەجیم؛ بەگزادەی نابووت ‹ماڵی خۆنەخۆر، بۆ چەکمەبۆرە «مەسەل»› ٢. لاسار و گوێنەبیس ≡ ١. اشرافزادەی مُفلس ٢. خودرای

**چەکمەڕەش** / çekmeřeş/: ناو. گیایەکی کوێستانییە، گەڵاکەی لە چنوور و لاسقی لە کەما دەکا، چلە ـچلە دەڕوێ ≡ گیاهی است

**چەکمەڕەق** / çekmeřeq/: ☜ **چەکمەبۆر**

**چەکمەزە** / çekmeze/: ناو. سندووق؛ سنۆق ≡ صندوق

**چەکمەسوورە** / çekmesûre/: ناو. باڵندەیەکە لە تۆرەمەی نکێنە، نزیک بە ٣٧ سانتیمیترە، کاتی فڕین لاقی لە کلکی تێدەپەڕێ، پشتی ڕەش و بەر زگی سپییە، بە هەنگاوی بڵیند و بە هێمنی بە ناو ئاودا دەڕوا، زۆر سڵە، دایمە جیکەجیکییە، لە گۆل و ئاوگراندا دەبینرێ، لە سەر گیای چڕ هێلانە دەکا ≡ چوب پا

**چەکناس** / çeknas/: ئاوەڵناو. هۆشیار؛ وریا ≡ هوشیار

**چەکنای** / çeknay/: چاوگ. مژین ≡ مکیدن

**چەکوپووش** / çek û pûş/: ناو. وردە و پردەی ماڵ ≡ خرت‌وپرت منزل

**چەکوچ** / çekuç/: ناو. چاکوچ؛ چەکوش؛ تەورئاسای چکۆلە بۆ بزمار کوتان و قەند شکاندن ≡ چکُش

**چەکوچڕ** / çek û çiř/: ناو. کاری چەکاندن ≡ عمل چکاندن

⊡ **چەکوچڕ دان**: دوامین دڵۆپ دەرهێنان ≡ تا آخرین قطره چکاندن

**چەکوچکاری** / çekuçkarî/: ناو. چەکوشکاری؛ کار و ڕەوتی کار کردن بە چەکوچ؛ کوتانەوەی شتێ، بەتایبەت کانزا بە چەکوش ≡ چکُش‌کاری

**چەکوچۆڵ** / çek û çoł/: ناو. چەکوچووڵ؛ چەک و ئامرازی شەڕ ≡ اسلحه و اسباب جنگ

**چەکوچووڵ** / çek û çûl/: ☜ **چەکوچۆڵ**

**چەکوش** / çekuş/: ☜ **چەکوچ**

**چەکوشکاری** / çekuşkarî/: ☜ **چەکوچکاری**

**چەکوکەوان** / çek û kewan/: ناو. ئامێری هەلاجی ≡ وسیله‌ی حلاجی

**چەکوور** / çekûr/: ناو. پێستی بە تووکەوە؛ کەوڵە حەیوانی تووک لێوە نەکراو ≡ پوست پشم نچیده‌ی حیوان

**چەکە**[١] / çeke/: ناو. ١. مشتە؛ مشتوو؛ کوتکی هەلاج ٢. [پلار] لەرە ‹هەر چەکەی سەری دێت› ٣. چەپکەپووڵ ≡ ١. مُشته‌ی پنبه‌زنی ٢. لرزش ٣. بسته‌ی پول

**چەکە**[٢]: ئاوەڵناو. ١. [پەلار] ڕووت و شڕۆڵ ٢. قسەخۆش؛ گاڵتەچی ≡ ١. لُخت و عریان ٢. بذله‌گو

**چەکە**[٣]: جێناو. چی؛ چە؛ چ شتێ ≡ چه؛ چه چیز

**چەکە**[٤]: دەنگەناو. دەنگ و دۆخی کەوشی کۆنی خراپ ‹چەکەی کەوشی دێت› ≡ صدا و حالت کفش کهنه

**چەکەچەک** / çekeçek/: دەنگەناو. دەنگەدەنگی کەوشی کۆن و دڕاو ≡ صدای پیاپی کفش کهنه

**چەکەخاڵانە** / çekexałane/: ناو. دابێکی کۆنی عەشیرەتییە، کاتی خوازبێنی دەبوو ئەسپ یا چەکێک بە دیاری بدرابایەتە خاڵی کچەکە تا ڕازی بێ ≡ از رسوم عشیرتی

**چەکەرداسی**[١] / çekerdasî/: ئاوەڵناو. [پەلار] زەبەلاحی بێکارە ≡ لندهور بیکاره

**چەکەرداسی**[٢]: ئاوەڵکار. [پلار] بە هاکۆ؛ بێ‌پێوانە و کێشانە ≡ رَمَکی

**چەکەرە / çekere/**: ناو. ١. چەقەرە؛ چک؛ چقیر؛ سەرەتای سەرهەڵدانی لکی تازە لە تۆم پاش چاندن ‹پیوازەکەمان چەکەرەی داوە› ٢. سپییایەکی کە بە سەر هەنجیری وشک و باسوخەوە دەبینرێ ≡ ١. اولین مرحلەی جوانەی دانە ٢. سپیدک انجیر خشک

☐ **چەکەرە دان:** ☜ **چەکەرە کردن**

**چەکەرە کردن:** چەکەرە دان؛ چووزە دەرکردنی دان کە سەرەتای سەوز بوونیە ≡ جوانە زدن

**چەکەرە لێکردن:** *[مەجاز]* سڵ لێکردن ≡ فاصلە گرفتن

**چەکەرەشکێن / çekereş(i)kên/**: ناو. کاری شێو کردنی زەمین لە سەرەتای بەهاردا ≡ شخم زمین در اوایل بهار

**چەکەسۆ / çekeso/**: ناوەڵناو. قەلەندەر؛ سەرپەتی؛ چەکهەسۆ؛ گوێنەدەر بە دنیا و داب و دەستووری دنیا ≡ قلندر

**چەکەسوو / çekesû/**: ناوەڵناو. چەکهەسوو؛ بەرچاوتەنگ؛ چاوتەنگ؛ چاوچنۆک ≡ حسود

**چەکەوچن / çekewçin/**: ناو. سواڵکەر؛ دەرۆزەکەر ≡ گدا

**چەکەوڕ / çekewiř/**: ☜ **چەقەوڕ**

**چەکهەسوو / çekhesû/**: ☜ **چەکەسوو**

**چەکیای / çekyay/**: چاوگ. مژران ≡ مکیدە شدن

**چەل / çel/**: ناو. ١. جار؛ هەل؛ حەل؛ دەحفە؛ کەڕەت ‹حەو جار بگەڕێ لە دەوری یارێ/ خاڵ ماچ کە هەزار چەلان نە جارێ «هەژار، *مەموزین*»› ٢. نۆبە لە گاڵتە و قومار ‹چەلی تۆیە، بیگەڕێنە!› ٣. کێس؛ دەرفەت؛ هەل ٤. ترۆپکی چیا ٥. دۆڵپا؛ بەڵای سەرشان ‹چەلە و لە ملە «مەسەل»› ≡ ١. دفعە؛ بار ٢. نوبت بازی ٣. فرصت ۴. قلەی کوە ۵. وبال گردن

**چەلا / çela/**: ناو. گوریسی مووین ≡ ریسمان

**چەلاخ / çelax/**: ناوەڵناو. هەدانەدەر ≡ ناآرام

**چەلاق / çelaq/**: ناوەڵناو. نەترس ≡ بیباک

**چەلاک / çelak/**: ناو. چەلاک؛ چەلاکە؛ چەلەکە؛ چەلەگە: ١. داری درێژی میوە تەکاندن ٢. کۆڵەکەی چادر ≡ ١. چوب بلند تکاندن میوە ٢. دیرک خیمە

**چەلاکە / çelake/**: ناو. ١. داری سەر بە قولاپە بۆ شت لە قووڵایی دەرهێنانەوە ٢. چلاک؛ داری درێژی دوو لک کە وە بەر چادر دەدرێ ≡ ١. چوب قلاب دار برای بیرون کشیدن اشیاء از چاه یا گودی ٢. دیرک خیمە

**چەلان[١] / çelan/**: چاوگ. چلیان؛ چەلین؛ ڕەخسان ‹من بۆم ناچەلێ پاڵ بدەمەوە و بێننە بەردەستم› ≡ فراهم شدن

**چەلان[٢]**: ناوەلکار. جاران؛ پێشوو ‹چەلان چابوو هەمانبوو تەختەدامە/ بەلام ئەوساڵ لە دێ دامە حەرامە! «هێمن»› ≡ قدیمها

**چەلاندن / çelandin/**: چاوگ. ١. ڕەخساندن ٢. لەوەڕاندن ≡ ١. فراهم کردن ٢. چراندن

**چەلاو / çelaw/**: ناو. ١. نۆکاو ٢. گۆشتاو ٣. ئاوی سەر و پێ ٤. زۆنگ و زەلکاو ≡ ١. نخوداب ٢. آب‌گوشت ٣. آب کلەپاچە ۴. باتلاق

**چەلاوی / çelawî/**: ناو. زق ≡ باتلاقی

**چەلپاندن / çelpandin/**: چاوگ. *[پلار]* خواردن و پیس کردن (بۆ سەگ) ≡ خوردن و آلودن (سگ)

**چەلپزاندن / çelp(i)zandin/**: چاوگ. پووچ دەرچوون و نەتەقینی وەک فیشەک لە تفەنگدا ≡ عمل نکردن فشنگ

**چەلتاندن / çeltandin/**: چاوگ. ١. تووڕە کردن؛ ڕق هەڵستاندن ٢. کەوڵ کردن؛ پێست لێکردنەوە ≡ ١. عصبانی کردن ٢. پوست کندن

**چەلتک / çeltik/**: ناو. ١. جەواڵی پچووک ٢. چەلتووک؛ برنجی بە تێکوڵەوە ≡ ١. جوال کوچک

٢. شلتوک

**چەلتین / çeltîn/**: چاوگ. ١. تووڕە بوون؛ ڕق هەڵستان ٢. کەوڵ کران؛ پێست لێ کرانەوە ☰ ١. عصبانی شدن ٢. پوست کنده شدن

**چەڵچەلە / çelçele/**: ناوەلکار. جاروبار؛ جارەوجار ☰ گاەبەگاە

**چەلخور / çelxûr/**: ناو. چەلغوور؛ گەسکی لە لقی گزیچار ☰ جارو از شاخەی درخت گز

**چەلخوس / çelxûs/**: ناو. ↓

▣ **چەلخوسی جۆ**: گوڵەجۆی پروێنراوی بۆدراو بۆ چێشت ☰ جو نارس بو دادە

**چەلخوسی گەنم**: گەنمی فەریکی لە ئاوی کولاتوو هەڵکێشراوی وشکەوەبووی لە دەستاڕ کراو ☰ خردە گندم نارس خشک شدە

**چەلغور / çelğûr/**: ☜ چەلخور

**چەلقاندن / çelqandin/**: ☜ چەلکاندن

**چەلقو / çelqû/**: ناوەلناو. *[پلار]* نزار؛ لەڕ و لاواز ☰ لاجون

**چەلقین / çelqîn/**: ☜ چەلکین

**چەلکاندن / çelkandin/**: چاوگ. چەلقاندن؛ جوولاندن ☰ حرکت دادن

**چەلکین / çelkîn/**: چاوگ. چەلقین؛ جوولان ☰ حرکت کردن

**چەلماندن / çelmandin/**: چاوگ. وە قسە خستن ☰ بە حرف آوردن

**چەلمین / çelmîn/**: چاوگ. ئاخەفتن؛ هاتنە قسە ☰ بە حرف آمدن

**چەڵوچۆم / çel û çom/**: ناوەلناو. ڕاساوە؛ خۆ گیف کردوو (بۆ شەڕ) ☰ آمادە (برای حملە)

**چەڵومل / çel û mil/**: ناو. دۆڵپا؛ بەلای دەستهەڵنەگر (لە من هەرگیز مەکە قوربان تەڵەب ئادابی هۆش و فام/ چەڵومل بەندەیێکی زەرخەریدی بێسەروپاتم «کەمالی») ☰ بلای بَختک

**چەلۆک / çelok/**: ناو. کوێزر؛ چەت؛ هێشووی گەنم یان جۆی لە خەرماندا نەشکاو ☰ کوزل

**چەلوز / çelûz/**: ناو. *[پلار]* پارسەکی بە گیرە و نیرە ☰ گدای سمج

**چەلە / çele/**: ناو. ١. گوریس؛ وەریس؛ پەت ٢. نۆرە لە یاریدا ☰ ١. ریسمان ٢. نوبتِ بازی

**چەلەبان / çeleban/**: ناو. ١. تەنافباز ٢. *[کنایە]* مرۆی هاروهاج ☰ ١. بندباز ٢. آدم بازیگوش

**چەلەپایی / çelepayî/**: ناو. جۆرێ دیلان ☰ نوعی رقص

**چەلەپەر / çeleper/**: ناوەلناو. جوانەمەرگ؛ بە لاوی مردوو ☰ جوانمرگ

**چەلەحانێ / çeleĥanê/**: ناو. دەمەقرە؛ دەمبەدەمە؛ شەڕەدندووکە ☰ جدال لفظی

**چەلەدان / çeledan/**: ناو. هەڵماتێن؛ ماتێن؛ ماتان؛ پلان ☰ تیلەبازی

**چەلەک / çelek/**: ناوەلناو. ١. خۆشڕۆ؛ بەپێ؛ بەکار لە ڕۆیشتندا (ئەسپی چەلەک) ٢. چەمیوە؛ داهاتوو ٣. جوان؛ خوشیک ☰ ١. رَهوار ٢. خمیدە ٣. زیبا

**چەلەکوڕی / çelekuřî/**: ناو. کۆترەگایە؛ کۆترەگایلکە ☰ کبوتر جنگلی

**چەلەکوری / çelekûrî/**: ناو. کۆترەگایە ☰ کبوتر جنگلی

**چەلەکوڕە / çelekûře/**: ناو. مشکگرە؛ باڵدارێکی ڕاوکەری بچووکە لە باشوو گچکەتر ☰ پرندەای کوچک شکاری

**چەلەنگ[١] / çeleng/**: ناو. ١. دەفری بە تەنەکە ٢. چلووکی دار ☰ ١. ظرف حلب ٢. شاخەی درخت

**چەلەنگ[٢]**: ناوەلناو. ١. شۆخ و شەنگ (ناسک و نازدار و شۆخ و شەنگ/ تەنک و شلک و جوان و چەلەنگ «هێمن») ٢. داماو؛ بەستەزمان ٣.

چوست و ئازا ☰ ١. زیبای رعنا ٢. وامانده ٣. چالاک

**چەلەنگ ـ چەلەنگ** / çeleng çeleng/: ئاوەڵکار. بە لەنجە و لار؛ خۆش ـ خۆش ‹هەروا دەڕوا چەلەنگ ـ چەلەنگ/ گەورە کچی بەگزادە ڕەنگ/ دانەی سەری کاری فەرەنگ «فولکلۆر»› ☰ خرامان

**چەلی**[١] / çelî/: ناو. گیایەکە لە تیرەی کەما و لۆ ☰ گیاهی است

**چەلی**[٢]: دەنگ. وشەی دەنگ دانی گا بۆ ڕۆیشتن ☰ واژەی راندن گاو

**چەلیان** / çelyan/: چاوگ. ١. توانین؛ کارین؛ شیان ٢. ڕێکهاتن؛ ڕەخسان ‹ئەو بۆی نەچەلی، باوکی دەولەمەندە› ☰ ١. توانستن ٢. دست دادن؛ امکان کاری فراهم بودن

**چەلیای** / çelyay/: چاوگ. چەلیان؛ ڕێک کەوتن؛ بۆ لوان ☰ مقدور بودن؛ دست دادن

**چەلیپا** / çelîpa/: ناو. خاچ؛ سەلیب ☰ صلیب

**چەلین** / çelîn/: ☜ چەلان[١]

**چەلینگ** / çelîng/: ناو. ١. گولبەند؛ گیایەکی بەپنجی جوانە ٢. گۆچان ☰ ١. گیاهی است ٢. عصا

**چەلێ** / çelê/: ☜ چەلێك

**چەلێک** / çelêk/: ئاوەڵکار. چەلێ: ١. جارێک؛ کەڕەتێک ٢. دەمێک؛ تاوێک ‹منیش جارێک بە سووری تۆخ، هەلێک بە شینی چویتی، چەلێک بە ناوی ئێرانیی سنووربەڕێنی غەوارەی بەدکار دادەنێن و بە چراوە لە دووم دەگەڕێن کە بمگرن! «هەژار، بۆ کوردستان»› ☰ ١. یک بار ٢. لختی

**چەڵاک** / çeľak/: ☜ چەلاك

**چەڵاکە** / çeľake/: ☜ چەلاك

**چەڵاو** / çeľaw/: ناو. ترێت؛ شۆرباوی تێکوشین ☰ ترید؛ تلیت

**چەڵتک** / çeľtik/: ☜ چەڵتوك

**چەڵتووک** / çeľtûk/: ناو. چڵتووک؛ چەڵتک؛ شەڵتووک؛ شەبلووک؛ برنجی هێشتا لە تێکوڵ دەرنەهاتوو ‹چوومە چەمی چەمچەقان/ چەقەڵ چەڵتووکی ئەچەقان «زمانخەڵەتێنە»› ☰ شلتوک

**چەڵتووکجاڕ** / çeľtûkcař/: ناو. چڵتووکجاڕ؛ مەرەزە؛ برنجاڕ؛ مەزرای برنج ☰ شالیزار

**چەڵتە** / çeľte/: ناو. *[بڵار]* چەقە و قسەی لابەلا ☰ سخن سبک

**چەڵتەباز** / çeľtebaz/: ☜ چەڵتەکەر

**چەڵتەچەڵت** / çeľteçeľt/: ناو. *[بڵار]* چەقەسرۆیی؛ چەنەدرێژی؛ چەنەوەری؛ درێژدادڕی ☰ پُرچانگی

**چەڵتەکەر** / çeľteker/: ئاوەڵناو. دەفەرۆ؛ دەفەژەن؛ چەڵتەباز؛ چەنەباز ☰ وراج

**چەڵغوو** / çeľğû/: ☜ چەرغوو

**چەڵک** / çeľk/: ناو. کەڵک؛ سەقا؛ کەراوی ☰ پلیکان سفید

**چەڵماس** / çeľmas/: ئاوەڵناو. چەڵماسک؛ چاوبرسی؛ چڵێس ☰ آزمند

**چەڵماسک** / çeľmasik/: ☜ چەڵماس

**چەڵەبی** / çeľebî/: ناو. جەڵەبچی؛ چۆدار ☰ چوبدار

**چەڵەک** / çeľek/: ناو. دارچەڵە؛ قیسپ؛ ئەو دارە ئەستوورەی چیغی پێوە دەبەستن ☰ میلەی چوبی

**چەڵەکە** / çeľeke/: ☜ چەلاك

**چەڵەگە** / çeľege/: ☜ چەلاك

**چەڵەم** / çeľem/: ناو. ١. کەڵەوە؛ کەڵەمە ٢. ئاڵقەی سەر قەیاسە ٣. دار گوردی تەون ☰ ١. حلقەی چوبی گردن گاو ٢. وهنگ ٣. چوبی در دستگاه قالیبافی

**چەڵەمە** / çeľeme/: ناو. چۆڵەمێ؛ چۆڵەمە: ١. کەڵەوە ٢. ئاڵقەی دارینی سەری قەیاسە ٣. هەر یەک لە دوو ئێسکی ژێر مل بە لای ڕاست و

چەپەوە لە نێوان باڵ و پەراسووبەند ‹قەیاسەی قایش پۆسەکەی جەستەم/ حەڵقەی چەڵەمەی پێشەی شکەستەم «مەولەوی»› ٤. *[مەجاز] گیر و گرفت، سەخڵەتی ‹تەنگ و چەڵەمەکانی ژیان›* ٥. *ئێسکی دووفلیقانەی نێوان باڵ و سنگی مریشک*
ﻋ ١. حلقەی چوبی کردن گاو ٢. وهنگ ٣. ترقوه ٤. گرفتاری ٥. جناغ مرغ

**چەڵەمەشکانێ** / çełemeş(i)kanê/: ☜ **چەڵەمەشکێنە**

**چەڵەمەشکێنە** / çełemeş(i)kêne/: ناو. چۆڵەمەشکێنە؛ چەڵەمەشکانێ؛ قوماری چۆڵەمە شکاندن کە هەرکەس لە بیری بچێ دەیدۆڕێنێ ﻋ عمل جناغ شکستن

**چەم**[1] / çem/: ناو. ١. چاو؛ چەهف ‹هەرچی دیت وە چەم شی وە سەفەردا/ هەرچی موینی ها نە گوزەردا «مەولەوی»› ٢. چۆم ‹چەم بێ چەقەڵ نابێ «مەسەل»› ٣. مێشەلانی لای چۆم ٤. دۆڵ؛ شیو؛ گەلی ٥. تەرز و شێوەی کار ‹لە چەمی کارەکە دەزانێ› ﻋ ١. چشم ٢. رودخانە ٣. بیشەی کنار رودخانە ٤. درّە ٥. چم‌وخم کار

▣ **چەم چەڤین**: ☜ **چاو پەڕین**

**چەم**[2]: ئاوەڵناو. خوار و لار ﻋ خمیده

**چەمئاخوڕە** / çem'axuře/: ناو. تامان بۆ ئاژەڵ ﻋ پرچین

**چەماش** / çemaş/: ئاوەڵناو. نائارام ﻋ چموش

**چەمان** / çeman/: چاوگ. چەمان؛ چەمیان؛ داهاتنەوە؛ بەرەو خوار و لار بوونەوە ﻋ خم شدن

**چەماندن** / çemandin/: چاوگ. تێپەڕ. //چەماندت؛ دەچەمێنی: بچەمێنە// چەمانن؛ چەماننەوە؛ چەماندنەوە؛ چۆماندن؛ چۆماندنەوە: ١. چڤاندن؛ خوار کردن؛ داهێنان ٢. *[کینایە]* ڕام و دەستەمۆ کردن ﻋ ١. خم کردن ٢. رام و مُطیع کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەچەماندن

**چەماندنەوە** / çemandinewe/: ☜ **چەماندن**

**چەمانن** / çemanin/: ☜ **چەماندن**

**چەماننەوە** / çemannewe/: ☜ **چەماندن**

**چەمانەوە** / çemanewe/: چاوگ. تێپەڕ. *//چەمایەوە، دەچەمێنیەوە، بچەمێوە// چەمیانەوە؛* چۆمانەوە؛ چەمینەوە؛ داهاتن؛ داهاتنەوە؛ لە باری ڕێک و ڕاستی هاتنە دەرەوە ‹پەلکەزێڕینەی پاش بارانی زۆر/ چەماوەتەوە بەرامبەر بە خۆر «گۆران»› ﻋ خم شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: چەماوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەچەمانەوە

**چەماو**[1] / çemaw/: ناو. ١. ترۆزی ٢. چۆمی گچکە ﻋ ١. خیار چنبر ٢. نهر

**چەماو**[2]: ئاوەڵناو. چەماوە؛ چەمتاوە؛ چەمیو؛ چەمیاگ؛ خوارەوەبوو؛ لاربوو ﻋ خمیده

**چەماوە** / çemawe/: ☜ **چەماو**[2]

**چەماوەسوو** / çemawesû/: ناو. ئاوەسوو؛ بەردی لووسی چۆم کە ئاو سواویە ﻋ سنگ صاف شدەی رودخانە

**چەماوی** / çemawî/: ناو. چەف؛ نووشتاوی ﻋ خمیدگی

**چەمای** / çemay/: چاوگ. چەمین ﻋ خمیدن

**چەمبریای** / çembiryay/: ناو. چاولێکەری؛ چاولێکەری ﻋ چشم‌وهم‌چشمی

**چەمبلول** / çemb(i)lûl/: ناو. پلووسک ﻋ ناودان

**چەمبڵ** / çembił/: ناو. هەنگڵ؛ دەسکەگۆزە و دیزە ﻋ دستەی خُم و کوزە

**چەمبۆڵە** / çembołe/: ناو. چەمۆڵە: ١. پووکاولە؛ پووک ٢. چنگ؛ پەنجە ﻋ ١. ام؛ پنجەی دست کە بە علامت تنفر رو بە کسی باز می‌کنند ٢. پنجەی دست

**چەمبەر** / çember/: ناو. ١. چەمەر؛ شین و شەپۆڕ ٢. ئالقە؛ گەو؛ کەمە ﻋ ١. شیون ٢. حلقە

**چەمبەرە** / çembere/: ناو. پەیکە؛ پاپۆکەی مار 🇮🇷 چنبر

◘ **چەمبەرە دان** پەیکە بەستن 🇮🇷 چنبر زدن

**چەمبەری** / çemberî/: ناو. دەسکی خەنجەر و شمشێر 🇮🇷 دستەی خنجر و شمشیر

**چەمپال** / çempal/: ناو. سەربار؛ لنگە بار یان بەستەیێ کە لە سەر باری بارەبەری دەنێن 🇮🇷 سربار

**چەمپل** / çempil/: ناو. چەپڵ؛ باڵ، لە سەر پەنجەوە تا شان 🇮🇷 دست و بازو

**چەمتاوە** / çemtawe/: ☜ **چەماو**[٢]

**چەمتەنگ** / çemteng/: ئاوەڵناو. بەرچاوتەنگ؛ بەئێرەیی 🇮🇷 حسود

**چەمج** / çemiç/: ناو. کەوگیز؛ کەوچکی دەمپانی بەننایی 🇮🇷 چمچەی بنّایی

**چەمچارکی** / çemçarkî/: ناو. تەزۆلازی؛ چاولەوەڕێنی 🇮🇷 چشم‌چرانی

**چەمچک** / çemçik/: ناو. چەمچە؛ ئەسکوێ؛ ئەسکوو 🇮🇷 چمچە

**چەمچور** / çemçur/: ناو. کەرمێشێکە زیانی بۆ ڕەز هەیە 🇮🇷 خرمگس آفت رز

**چەمچۆر** / çemçor/: ئاوەڵناو. *[پەلار]* لەڕ و لاواز 🇮🇷 لاجون

**چەمچە** / çemçe/: ☜ **چەمچك**

**چەمچەقوڵە** / çemçequle/: ناو. مژمژە؛ جۆرێک نوقلە دەسکی تێ خراوە و منداڵ دەیمژن 🇮🇷 آب‌نبات چوبی

**چەمچی** / çemçî/: ☜ **چەرچی**

**چەمچیر** / çemçîr/: ناو. ١. هەلۆرک؛ جۆلانەی نەخۆش و منالان ٢. جۆرێ ترێی ڕەش 🇮🇷 ١. ننو ٢. نوعی انگور سیاه

**چەمرە** / çemre/: ناو. بنتا؛ وەچی شلک و نەرمی دارەبی کە دوای برین هەڵدەداتەوە 🇮🇷 جوانەی نرم و تر درخت بید کە بعد از بریدن دوبارە می‌روید

**چەمزاق** / çemzaq/: ☜ **چاوزەق**

**چەمقالاو** / çemqaław/: ناو. گوڵەدیاری؛ گوڵەئەسپەک؛ گوڵ دیاری 🇮🇷 گلایول

**چەمک** / çemk/: ناو. ١. مەبەست؛ ئەوی وتار یان نووسراوەیەک بەنیازە ڕایگەیەنێ ٢. گۆشە؛ لا ‹بەلام کاتێ کە با چەمکی عەباکەی لادەدا تاوێ، دەڕێژێ پووزی نایابی لە سیحری خوایی لافاوێ «هەردی»› 🇮🇷 ١. مطلب ٢. گوشە

**چەمل** / çeml/: ناو. قوڵفەی هیربار 🇮🇷 دستەی کوزە

**چەمنای** / çemnay/: چاوگ. چەماندن 🇮🇷 خم کردن

**چەموچوخمو** / çem û çuxmû/: ☜ **چەموچوخوڕ**

**چەموچوخوڕ** / çem û çuxuř/: ناو. چەموچوحموو؛ چەموچوغورد؛ مێشە و قامیشەڵێنی چڕوپڕ 🇮🇷 بیشە و نیزار انبوە

**چەموچوغورد** / çem û çuğurd/: ☜ **چەموچوخوڕ**

**چەموخەم** / çem û xem/: ناو. لارولەنجە؛ لەنجەولار؛ کردە یان ڕەوتی لەنجە کردن 🇮🇷 خرام

**چەمۆڵە** / çemołe/: ناو. ١. ☜ **چەمبۆڵە** ٢. پەنجە بە بلاوی ٣. چنگ و پەل؛ چنگاڵ 🇮🇷 ١. ☜ **چەمبۆڵە** ٢. پنجەی باز دست ٣. چنگال

◘ **چەمۆڵە دادان** پەنجە لە سەر زەوی درێژ کردنی دڕندە ‹شێریک چەمۆڵەی دادابوو› 🇮🇷 پنجە انداختن درندگان روی زمین

**چەمۆڵە گرتن** چەمۆڵە لێنان؛ پووکاوڵە لێنان؛ پووک نیان 🇮🇷 ام کردن

**چەمۆڵە لێنان** ☜ **چەمۆڵە گرتن**

**چەموور** / çemûr/: ئاوەڵناو. لاسار؛ گوێنەبیس 🇮🇷 حرف‌نشنو

**چەمووش** / çemûş/: ئاوەڵناو. سڵ؛ ڕەوەک؛

لەقەهاوێژ و گازگر 🇮🇷 چموش

**چەمە** / çeme/: ناو. ١. چاوە؛ یەک ژوور ٢. سەرچاوە؛ کانی ‹چەمە و بلچەمێ› ٣. کەمەی دەف و بێژنگ و ... 🇮🇷 ١. اتاقی در خانە ٢. سرچشمە ٣. چوب مدور شدەی دف و امثال آن

**چەمەدان** / çemedan/: ناو. جانتا؛ چیمانی؛ ساکی گەورە و چوارگۆشێ لە چەرم یان ماکی دەسکرد بۆ کەلپەلی سەفەر تێ نان 🇮🇷 چمدان

**چەمەر** / çemer/: ناو. ١. شین و شەپۆر ٢. کەمە 🇮🇷 ١. شیون و زاری ٢. حلقە

**چەمەرانە** / çemerane/: ناو. هەوای چەمەری 🇮🇷 آهنگ عزای چمری

**چەمەرچۆپی** / çemerçopî/: ☜ **چەمەری**

**چەمەرگە** / çemerge/: ناو. شیوەنگا 🇮🇷 شیونگاه

**چەمەرگێڕ** / çemergêř/: ناو. شینگێڕ 🇮🇷 عزادار

**چەمەرە** / çemere/: ناو. ١. ئاڵقەی لە دار ٢. خەیار چەمەر ٣. چەمەر؛ شینوشەپۆر 🇮🇷 ١. وهنگ ٢. خیار چنبر ٣. شیون و زاری

**چەمەری** / çemerî/: ناو. چەمەرچۆپی؛ کاری لاواندنەوەی مردوو وێڕای دەهۆڵ لێدان ‹گوێم گرت کەوتە سەر بەزم و شۆری نەی/ چۆپی، چەمەری مقامی وەی وەی «قانع»› 🇮🇷 نوحەخوانی با دُهُل

**چەمەڕا** / çemeřa/: ناوەڵناو. چەمەڕێ؛ چاوەڕێ؛ چاوەنۆڕ ‹گیای پەژموردەی تەژنەکەی بێ شۆم/ چەمەڕای وارای هەور لوتف تۆم «مەولەوی»› 🇮🇷 چشم‌بەراه

**چەمەڕایی** / çemeřayî/: ☜ **چاوەڕوانی**

**چەمەڕێ** / çemeřê/: ☜ **چەمەڕا**

**چەمەزەخم** / çemezexm/: ☜ **چاوەزار-١**

**چەمەزەخمە** / çemezexme/: ☜ **چاوەزار-١**

**چەمەسیاوڵە** / çemes(i)yawłe/: ناو. گیایەکە 🇮🇷 گیاهی است

**چەمەقووڵە** / çemeqûłe/: ☜ **چاوقووڵکە**

**چەمەڵۆکە** / çemełoke/: ☜ **چەپۆك**

**چەمەن** / çemen/: ناو. ١. چیمەن ‹وەرەق ڕێزان، خەزان کەوتە ڕەزان، وەزعی چەمەن گۆڕا/ بەسەر چوو فەسڵی گوڵگەشت و تەماشای باغ و سەحراکەم «وەفایی»› ٢. باخی یەکسەر لە دار چنار 🇮🇷 ١. چمن ٢. باغ درختان چنار

**چەمەنتۆ** / çemento/: ☜ **چیمەنتۆ**

**چەمەند** / çemend/: ناو. ئەسپی شێ؛ ئەسپ یان ماینی ڕەنگ ئاماڵزەرد 🇮🇷 اسب سمند

**چەمەودما** / çemewd(i)ma/: ناوەڵناو. چاولەدوو؛ چاوەڕوان؛ بە تاسە بۆ دیتن 🇮🇷 چشم‌انتظار

**چەمیاگ** / çemyag/: ☜ **چەماو**[٢]

**چەمیاگی** / çemyagî/: ناو. چەمیاوی؛ دەرپەڕیوی (زۆرتر بۆ پشت) 🇮🇷 خمیدگی (پشت)

**چەمیان** / çemyan/: ☜ **چەمان**

**چەمیانەوە** / çemyanewe/: ☜ **چەمانەوە**

**چەمیاوی** / çemyawî/: ☜ **چەمیاگی**

**چەمیای** / çemyay/: چاوگ. چەمان 🇮🇷 خم شدن

**چەمیخانی** / çemîxanî/: ناو. دارستانی توو 🇮🇷 باغ توت

**چەمیش**[١] / çemîş/: ناو. پێلاو؛ پێلا 🇮🇷 کفش

**چەمیش**[٢]: ناوەڵناو. چەمووش 🇮🇷 چموش

**چەمیلە** / çemîle/: ناو. ترۆزی 🇮🇷 خیار چنبر

**چەمین**[١] / çemîn/: چاوگ. داهاتنەوە؛ لار بوونەوە 🇮🇷 خمیدن

**چەمین**[٢]: ناو. شیاکە؛ ڕیخ 🇮🇷 سرگین

**چەمینەوە** / çemînewe/: ☜ **چەمانەوە**

**چەمیو** / çemîw/: ☜ **چەماو**[٢]

**چەمیوە** / çemîwe/: ناوەڵناو. چەلەک؛ داهاتوو 🇮🇷 خمیدە

**چەن**[١] / çen/: ناو. ١. دەرزی؛ سووژن ٢. چەناگە؛ چناکە؛ ئەرزینگ 🇮🇷 ١. سوزن ٢. چانە

**چەن**[2]: ئاوەڵناو. چەند 🇮🇷 چند

**چەن**[3]: ئاوەڵکار. چقاس؛ چەند 🇮🇷 چقدر

**چەن -**[4]: پێشوشە. چەند ـ ‹چەنبەرەکی› 🇮🇷 چند ـ

**چەناخ / çenax/**: ناو. ١. کرمەک؛ خشڵێکی ژنانەیە ٢. چەنەگە؛ ئەرزینگ 🇮🇷 ١. زیوری زنانە ٢. چانە

**چەناکە / çenake/**: ☜ **چەناگە**

**چەناکێ / çenakê/**: ☜ **چەناگە**

**چەناگە / çenage/**: ناو. چناکە؛ چەنە؛ چەنەگە؛ ئارچەن؛ چنا؛ چناکێ؛ چناوکە؛ چنەوا؛ چنەوە؛ چەناکە؛ ئارزینگ؛ ئەرزنگ؛ ئەرزینگ؛ هەنەک؛ ژوون؛ زنج؛ ئاگرگوشک؛ بەشی خوارینی دەم و چاو کە بە شێوەی گردوڵکەیەک لە بەر هارووی ژێرەوە هەڵکەوتووە 🇮🇷 چانە

◘ **چەناگە دان:** *[پلار]* چەنە لێدان؛ فرەبێژی کردن؛ هەڵەوەڕی کردن 🇮🇷 وراجی کردن

**چەناگە کوتان:** *[کینایە، پلار]* گیان دان؛ ئاویلکە دان 🇮🇷 در حال نزع بودن

**چەناگەباز / çenagebaz/**: ☜ **چەنەباز**

**چەناگەبازی / çenagebazî/**: ناو. زۆربلەیی؛ فرەوێژی؛ چەنەبازی ‹موفتی بەسیەتی چەناگەبازی/ بەم بێکەسییە بە کێ ئەنازی! «موفتی پێنجوێنی»› 🇮🇷 چانە

**چەناگەدرێژ / çenaged(i)rêj/**: ئاوەڵناو. *[پلار]* چەناگەشکاو؛ زۆربلێ؛ فرەوێژ؛ چەنەباز؛ هەڵەوەڕ 🇮🇷 پُرچانە

**چەناگەشکاو / çenageş(i)kaw/**: ☜ **چەناگەدرێژ**

**چەناگەکوتێ / çenagekutê/**: ناو. *[کینایە، پلار]* گیانەلاو؛ ئاویلکە 🇮🇷 نزع

**چەنبەر / çenber/**: ناو. کەمە؛ دەورەی هەر شتێ 🇮🇷 محیط؛ پیرامون هر چیز

**چەنبەرەکی / çenberekî/**: ناو. چەن‌دەستەیی؛ دۆخی گرۆ ـ گرۆ بوونی کۆمەڵێک بە هۆی ناکۆکی نێوانیان 🇮🇷 تفرقە؛ چنددستگی

**چەنتک / çentik/**: ناو. هەگبە؛ خورجێنی پچووک بۆ زاد 🇮🇷 توشەدان

**چەنتە / çente/**: ناو. جانتا 🇮🇷 ساک

**چەنجوز / çencûz/**: ئاوەڵناو. *[پلار]* ١. لاواز؛ لەڕ؛ لەجەر؛ دالگۆشت ٢. ڕەزیل؛ ڕژد 🇮🇷 ١. لاغر؛ لاجون ٢. خسیس

**چەنچڕۆک / çenç(i)řok/**: ☜ **چینچڕوک**

**چەنچوز / çençûz/**: ☜ **چاوبرسی**

**چەند**[1] **/ çend/**: ناو. چەن؛ چەندی؛ چەندێتی ‹ئەوساڵ گوێزی زۆرم دی بە دارەوە بەلام چەندەکەی نازانم› 🇮🇷 کمیّت؛ مقدار

**چەند**[2]: ئاوەڵناو. چەن؛ بۆ پرسیار لە ئەژماری شتێ ‹چەند ساڵتە؟› 🇮🇷 چند؛ چقدر

**چەند**[3]: ئاوەڵکار. چقاس؛ چەن ‹چەند خۆشە!؛ چەند بەرز دەبێتەوە› 🇮🇷 چقدر

**چەند**[4]: جێناو. چەنێ ‹دەبێتە چەند؟› 🇮🇷 چند

**چەند -**[5]: پێشوشە. چەن ـ ‹چەندمانگە؛ چەندلایی› 🇮🇷 چند ـ

**چەندان / çendan/**: ئاوەڵناو. هێندە؛ ئەوەندە ‹چەندان کاری نییە› 🇮🇷 چندان

**چەندانە / çendane/**: ئاوەڵناو. بە زۆرتر لە یەک توخم، بیچم یان چۆنیەتییەوە 🇮🇷 چندگانە

**چەندایەتی / çendayetî/**: ناو. گورانی؛ چەندی؛ چەندێتی 🇮🇷 کَمیّت

**چەندپاڵو / çendpałû/**: ناو. بیچمی هیندسی بە زۆرتر لە چوار پاڵوو 🇮🇷 چندوجهی

**چەندرێیان / çendřêyan/**: ☜ **چاتەڕێ**

**چەندن / çendin/**: چاوگ. چاندن؛ تۆم وەشاندن 🇮🇷 کاشتن؛ بذر افشاندن

**چەندوچۆن / çend û çon/**: ناو. هەند و چۆنیەتی؛ چەنیەتی و چۆنیەتی ‹هەر کات لە چەندوچۆنی ئەم کارە تێگەیشتی، ئەوجار بینووسە› 🇮🇷 چندوچون

**چەندوچوون / çend û çûn/**: ناو. وەرام و پرسیار؛ قسە و باس ≡ چک‌وچانە

**چەندە¹ / çende/**: ئاوەڵناو. چەنێ؛ چەنی ‹چەندە قەرزداری؟› ≡ چقدر

**چەندە²**: ئاوەڵکار. چەنێ؛ چەنی: ١. گەلەک؛ زۆر ‹ئای چەندە گەرام!؛ چەندە جوان دەنووسێ!› ٢. بۆ پرسیار ‹چەندە دەخەوی؟› ≡ ١و٢. چقدر

**چەندە³**: جێناو. چەنێ؛ چەنی ‹چەندمت هەیە؟؛ چەندمت ژمارد؟› ≡ چقدر

**چەندەسەیی / çendeseyî/**: ناو. چەن‌بەرەکی ≡ چنددستگی

**چەندهێشە / çendhêşe/**: ناو. نەرمەگا؛ زەوی خۆشکراو ≡ زمین چندبار شُخم‌زده

**چەندی¹ / çendî/**: ئاوەڵناو. چەنی؛ خاوەن چەند ئەژمار یان یەکە ‹دولاری چەندی؟› ≡ چقدری

**چەندی²**: جێناو. چەنی ‹چەندیت پێ دام؟› ≡ چقدری

**چەندی‌بەچەندی / çendî be çendî/**: سارستە. چی بە سەر چییەوە؛ کوێی بە سەر کوێوەیە ≡ کجا بر کجا

**چەندین / çendîn/**: ئاوەڵناو. چەند؛ جەماعەتێک ‹چەندین پشیلە تەمایر مشکێکن «مەسەل»› ≡ چندین

**چەندێتی / çendêtî/**: ناو. ڕادەی زۆری و کەمی ≡ کمیّت

**چەندێک / çendêk/**: ئاوەڵکار. ماوەیەک؛ هێندێک ‹چەندێکی پێ‌چوو و نەهاتەوە› ≡ چندی

**چەنسووتەکە / çensûteke/**: ☚ **چنگ‌سوتەکە**

**چەنکارە¹ / çenkare/**: ناو. کەرستەیێ کە چەن کاری وەک ورد کردن، تێکەڵ کردن، توێ ـ توێ کردن و... دەکا ≡ چندکاره

**چەنکارە²**: ئاوەڵناو. بە چەن بەشی تایبەتەوە بۆ ئەنجامدانی چەن کاری جۆراوجۆر ‹هاچەری چەندکارە› ≡ چندکاره

**چەنگ¹ / çeng/**: ناو. ١. چنگ؛ پەنجە ٢. باڵی مەل ٣. مامزەی چەکمەی سواران ٤. ئامرازێکی مووسیقایە ٥. زەنگۆڵە ≡ ١. چنگ؛ پنجه ٢. بال پرندگان ٣. مهمیز ۴. ساز چنگ ۵. زنگوله

**چەنگ²**: ئاوەڵناو. مات و پەشێو ≡ مبهوت

⊡ **چەنگ بوون** شێوان؛ مات و پەشێو بوون ≡ آشفته و مبهوت بودن

**چەنگاڵ / çengał/**: ☚ **چنگاڵ**

**چەنگچیل / çengçîl/**: ئاوەڵناو. زرینگ؛ زرنگ؛ زیت ≡ زرنگ

**چەنگل / çengil/**: ناو. چەنگاڵ؛ قولاپ ≡ قُلاب

**چەنگلفە / çengl(i)fe/**: ناو. دەسبلاوی ≡ ولخرجی

**چەنگومل / çeng û mil/**: ناو. چنگاوش؛ دەسەویەخە ‹قوربانی زکی برسی و عینوانی زلت بم/ دەس هەڵگرە لەم زوڵمە نەوا چەنگ‌وملت بم «قانع»› ≡ دست به یقه

**چەنگۆش / çengoş/**: ناو. چەن‌گۆشە؛ بیچمی هیندسی تەخت کە زۆرتر لە چوارگۆشەی هەبێ ≡ چندضلعی

**چەنگۆشە / çengoşe/**: ☚ **چەن‌گۆش**

**چەنگە / çenge/**: ناو. چنگە؛ دار یان ئاسنی سەر بە قولاپ ≡ چنگک

**چەنگەپرچە / çengepirçe/**: ☚ **چنگەپرچە**

**چەنە / çene/**: ناو. چەناگە؛ ئەرزینگ ≡ چانه؛ زنخ

⊡ **چەنە بەرنەهاتن** */پلار/* دەرەقەت نەهاتن لە شەڕەقسەدا ≡ زبان کم آوردن

**چەنە دان** */پلار/* فرەوێژی کردن؛ چەنەچەن کردن ≡ زبان‌درازی کردن

**چەنە لێدان** ☚ **چەناگە دان**

**چەنەباز / çenebaz/**: ئاوەڵناو. */پلار/* چەنەوێرغە؛ چەناگەباز؛ چەقەسرۆ؛ هەڵەوەڕ. هەروەها:

**چەنەبازی** وراج؛ پرگو

**چەنەبەچەنە** / çenebeçene/: ناو. شەڕەچەقە؛ کاری دەم‌لەدەم نان درگیری لفظی

▣ **چەنەبەچەنە وێستان** شەڕەقسە کردن جدل کردن

**چەنەچەن** / çeneçen/: ناو. [پلار] زمان‌درێژی؛ هەڵەوەڕی ‹ئەوان تاقەتی چەنەچەن و سەرئێشەیان نییە› زبان‌درازی

**چەنەدرێژ** / çened(i)rêj/: ناوەڵناو. [پلار] زۆربڵێ پرگو

**چەنەدرێژی** / çened(i)rêjî/: ☜ چەڵتەچەڵت

**چەنەکون** / çenekun/: ناوەڵناو. [پلار] تایبەتمەندی کەسێ کە لە کاتی خواردنی شتی شل و تراو وەک ماست و فرنی زۆر جار لێی دەڕژێ ویژگی کسی که هنگام خوردن خوراکی شُل، از دست و دهانش بریزد

**چەنەگە** / çenege/: ☜ چەناگە

**چەنەوەر**[1] / çenewer/: ☜ چەوەندەر

**چەنەوەر**[2]: ناوەڵناو. [پلار] چەنەباز؛ هەڵەوەڕ؛ زۆربێژ زبان‌دراز

**چەنەوەری** / çenewerî/: ☜ چەڵتەچەڵت

**چەنەوێرغە** / çenewêrğe/: ☜ چەنەباز

**چەنەهەراش** / ceneheraş/: ناوەڵناو. [پلار، مەجازی] چەنەباز؛ هەڵەوەڕ؛ زۆربێژ زبان‌دراز

**چەنی**[1] / çenî/: ناو. دەرزی دروومان سوزن

**چەنی**[2]: ئامراز. لەگەڵ؛ لەتەک ‹سونبول چەنی تیپ وەنەوشەی باخان/ چنوور نە پای هەرد شەوبۆی سەرشاخان «سەیدی»› زبان‌دراز

**چەنیدان** / çenîdan/: ناو. دەرزیدان جاسوزنی

**چەنێ**[1] / çenê/: ناوەڵناو. چەندە ‹ڕۆژانە چەنێ کار ئەکەی؟› چقدر

**چەنێ**[2]: ناوەڵکار. چەندە ‹چەنێ فەقیرە! چەنێ ئەتانی بخوەی؟› چقدر

**چەنێ**[3]: جێناو. ۱. چەن؛ چەند ‹ئەکاتە چەنێ؟› ۲. ئەوەندەی ‹چەنێ دانیشتم، تۆیش ئەشێ دانیشی!› ۱. چند ۲. به اندازه‌ای

**چەو** / çew/: ناو. ۱. ورتکەبەرد؛ زیخ؛ خیز ‹دێم بەرەو زیخ و چەوو کانیاوی خۆم/ چۆن لەوانە وەردەگێرم چاوی خۆم «هێمن»› ۲. چاو ‹چەن شاران گەڕیام چەن دوکان بەستم/ سورمەی چەوگەد وە دەس نەخستم «فولکلۆر»› ۱. شن ۲. چشم

**چەوا**[1] / çewa/: ناوەڵناو. چاوا؛ چۆن چگونه

**چەوا**[2]: ناوەڵکار. چاوا؛ چۆن چگونه

**چەوار** / çewar/: ناو. قاسید؛ هەواڵبەر؛ شاندیار پیک؛ چاپار

**چەواشە** / çewaşe/: ناوەڵناو. ۱. دژ؛ پێچەوانە ‹جەرگت لەت لەت بۆ چەواشەی چەپگەرد/ خالۆت جیا کەرد، یە کار بێ تۆ کەرد «مەولەوی»› ۲. شێواو؛ شێویاگ؛ تێکچوو ‹مەگەر تەخت و بەخت بوێ چەواشە/ ئەوسا واز بێرن لەم ئاشی ماشە! «ئاغا عینایەت»› ۱. مُخالف ۲. آشفته

▣ **چەواشە کردن** ۱. شێواندن و هەڵگەڕاندنەوەی ڕاستییەکان ‹دەسەلات هەوالی خۆپیشاندانەکانی خەڵک چەواشە دەکا› ۲. سەر لێ شێواندن ‹حیزبە سیاسییەکان بە پروپاگەندا خەڵک چەواشە دەکەن›. هەروەها: **چەواشە بوون** ۱. تحریف کردن واقعیت ۲. مُشوّش کردن

**چەواشەکار** / çewaşekar/: ناوەڵناو. تایبەتمەندی کەسێ کە ڕاستییەکان پێچەوانە بخاتە پێش چاوان و سەر لە گوێگری خۆی بشێوێنێ تحریف‌کننده

**چەواشەکاری** / çewaşekarî/: ناو. کار و ڕەوتی شێواندن و هەڵگەڕاندنەوەی ڕاستییەکان تحریف

**چەوان** / çewan/: ☜ چاودار-۱

**چەوباز** / çewbaz/: ☜ **چاوچەرێن**

**چەوبازە** / çewbaze/: ☜ **چاوبانکە**

**چەوبازی** / çewbazî/: ☜ **چاوچەرێتی**

**چەوپێسی** / çewpêsî/: ☜ **چاوچەرێتی**

**چەوت** / çewt/: ئاوەڵناو. لار؛ خوار؛ چەفت ⯀ خم؛ کج

**چەوتان** / çewtan/: چاوگ. چەمانەوە ⯀ خم شدن؛ کج شدن

**چەوتاندن** / çewtandin/: ☜ **چەوتاندنەوە**

**چەوتاندنەوە** / çewtandinewe/: چاوگ. چەوتاندن؛ لارەوە کردن؛ خوار کردنەوە ⯀ خم/کج کردن

**چەوتانەوە** / çewtanewe/: چاوگ. لار بوونەوە؛ خوار بوونەوە ⯀ خم/کج شدن

**چەوتاوە** / çewtawe/: ئاوەڵناو. داهاتوو؛ خوارەوەبوو ⯀ کج؛ خمیده

**چەوتوچەوێڵ** / çewt û çewêł/: ئاوەڵناو. چەوتوچیر؛ چەوتوچێڵ؛ چەفتوچەوێڵ؛ خوار و خێچ ⯀ کج و کوله

**چەوتوچیر** / çewt û çîr/: ☜ **چەوتوچەوێڵ**

**چەوتوچێڵ** / çewt û çêł/: ☜ **چەوتوچەوێڵ**

**چەوتە**[1] / çewte/: ناو. ڕێگە لە قەدی کێودا ⯀ راه کوهستانی

**چەوتە**[2]**ـ**: پێشوشە. لارە- ⯀ کج -

**چەوتەک** / çewtek/: ناو. ١. داربەس؛ قایمە ٢. لکی نەبڕاوی ژێر زەوی خراو لە جێگەی شەتڵ ⯀ ١. داربست ٢. شاخەی خوابیده برای تکثیر

**چەوتەکەڵ** / çewtekeł/: ☜ **چەفتەکەڵ**

**چەوتی** / çewtî/: ناو. لاری: ١. گێری؛ خواری؛ بارودۆخی لار و گێر بوون ٢. *[مەجاز]* دۆخی ناڕاست بوون؛ نادروس بوون ⯀ ١. حالت کج بودن ٢. وضع یا حالت منحرف بودن

**چەوچە** / çewçe/: ناو. مەتەڵ ⯀ مُعما

**چەوچەو** / çewçew/: ناو. شڵەژاوی؛ شێواوی ⯀ آشفتگی

**چەوچەوی** / çewçewî/: ☜ **چاوەڕوانی**

**چەودار** / çewdar/: ☜ **چاودار-١**

**چەودان** / çewdan/: ☜ **چاودار-١**

**چەودەر** / çewder/: ☜ **چاودار-١**

**چەودەم** / çewdem/: ناو. پاشملە؛ خوسپ ⯀ غیبت

**چەودەن** / çewden/: ☜ **چاودار-١**

**چەور**[1] / çewr/: ناو. گیایەکە وەک بەندۆک لە نێو شیرێژ دەکرێ ⯀ گیاهی است

**چەور**[2]: ئاوەڵناو. چەروو: ١. خاوەن چەوری ‹گۆشتی چەور› ٢. چەورچلیک؛ دوین؛ زومدار؛ شۆل؛ دهون؛ ئاوێتەی چەوری ‹دەستی چەور› ٣. *[کنایە]* فرە؛ مایەدار؛ زۆر یا زۆرتر لە باری چەندێتییەوە ‹مامەڵەی چەور› ⯀ ١تا٣. چرب

⊡ **چەور کردن**: تێهەڵسوونی ڕۆن، نەوت یان هەر شتێکی چەور ⯀ چرب کردن

**چەوراوی** / çewrawî/: ئاوەڵناو. چەور؛ شۆل؛ دهون؛ دوین؛ بە چەورییەوە تلاو ⯀ چرب

**چەورایی** / çewrayî/: ناو. چەوری ⯀ چربی

**چەورچەورۆکە** / çewrçewroke/: ناو. چەورکە؛ چەورینە؛ چەورۆکە؛ گیایەکە بەرەکەی وەک چەور بێ وایە ⯀ گیاهی است

**چەورسان** / çewrsan/: ☜ **چەورەسان**

**چەورستان** / çewristan/: ☜ **چەورەسان**

**چەورک** / çewrik/: ☜ **چەورەبی**

**چەورکە** / çewrke/: ☜ **چەورچەورۆکە**

**چەوروچلیک** / çewr û ç(i)łîk/: ئاوەڵناو. چەور و چلکن؛ چلکنی چەور ‹کابرایەکی چەور و چلیکە!› ⯀ چرب و چیلی

**چەوروشیرن** / çewr û şîrin/: ناو. چەوروشیرین؛ جۆرێک مووروەی بەلەکە دەڵێن بۆ خۆشەویستی بەکارە ⯀ نوعی مُهرەی گردنبند

**چەوروشیرین** / çewr û şîrîn/: ☜ **چەوروشیرن**

**چەورونەرم** / çewr û nerm/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* زمانلووس؛ مرۆخەڵەتێن بە قسەی خۆش ☗ چرب‌زبان

**چەورۆکە** / çewroke/: ناو. ١. ☜ **چەورووکە** ٢. چەورینە ☗ ١. ☜ **چەورووکە** ٢. گیاهی است

**چەورووکە** / çewrûke/: ناو. چەورۆکە؛ کاردەپەلە؛ تەیر؛ تەرنەبابیلە؛ پەڕەمەساسە؛ پالوانە؛ تەیرەن‌ئەبابیل؛ خەنجەربال؛ خەنجەربالە؛ شمشێربال؛ تەیرەکوێرە؛ تۆرەمە باڵندەیەکە رواڵەتیان لە پەڕەسێلکە دەکا، لەشیان باریک و باڵیان درێژە و لە دەمەداس دەچێ، کلک و قاچیان کورتە، بە پۆل دەگەڕن و زۆر تیژباڵن، لە کونانـدا هێلانە ساز دەکەن و زیاتر لە چوار جۆریان هەیە ☗ بادخورک

**چەورە**[١] / çewre/: ناو. دەسەسڕ؛ دەسرەی دەست؛ دەسماڵ ☗ دستمال

**چەورە**[٢]: ئاوەڵناو. نەوسنی مالانگەڕ و بێکارە ☗ شکم‌پرست بیکاره

**چەورەبی** / çewrebî/: ناو. چەورک؛ چەورکە؛ گیابەرخۆلە؛ گیایەکی کوێستانییە، گەڵاکانی لە گەڵای دار بی دەچێ، خۆراکی ئاژەڵە ☗ گیاهی است خوراک دام

**چەورەسان** / çewresan/: ناو. چەورستان؛ چەورسان؛ کەمووکەیەک رۆن کە هەسانی پێ تیژ دەکەن ‹لەگەڵ خۆ بێنن هەمبانە نانێ/ بەرەمەشکەی رۆن بۆ چەورەسانێ! «حەقیقی»› ☗ اندک چربی روی سنگ سای

**چەورەیی** / çewreyî/: ناو. چڵێسی ☗ شکم‌پرستی

**چەوری** / çewrî/: ناو. چەورایی؛ چەڤری؛ چەربی؛ چەرمی؛ زوهـۆم؛ زفـر؛ مـرت؛ زۆن؛ تـەواش؛ زەرنووقایی: ١. ماکێکی رۆنی کە لە تینی ئاسایيدا گیرساوە ٢. غەز؛ وەز؛ دۆن؛ بەز؛ چەورایی؛ پی؛ رۆنی لەشی گیانەوەران ٣. *[سەرزارەکی]* چێشتی چەور ‹بژیشک گوتوویە چەوری مەخۆ› ☗ ١تا٣. چربی

⊡ **چەوری دان**: چەور کردنی هەسان و ... ☗ چربی زدن بر سنگ ساب و...

**چەورینە** / çewrîne/: ☜ **چەورچەورۆکە**

**چەورێکە** / çewrêke/: ناو. مەلێکە لە چێشکە چکۆلەتر ☗ پرنده‌ای کوچک

**چەوڕێژ** / çewřêj/: ناو. خیزڕێژ؛ ڕێگەی زیخ تێ‌کراو ☗ شن‌ریزی

**چەوس** / çews/: ناو. چەسپ ☗ چسب

**چەوسان** / çewsan/: ☜ **چەوسانەوە**

**چەوساندن** / çewsandin/: چاوگ. ١. ڕەنج پێ دان ٢. ستەم لێ‌کردن ☗ ١. رنج دادن ٢. ستم کردن

**چەوساندنەوە** / çewsandinewe/: چاوگ. تێپەڕ. //چەوساندتەوە؛ دەچەوسێنیەوە؛ بچەوسێنەوە// چەرمەسەرێ دان ☗ رنج و آزار دادن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـــ/ چاوگی نەرێنی: نەچەوساندنەوە

**چەوسانەوە** / çewsanewe/: چاوگ. تێنەپەڕ. //چەوسایەوە؛ دەچەوسێیەوە؛ بچەوسێوە// چەوسان؛ ڕەنج دان؛ زەحمەت کێشان ☗ رنج و آزار کشیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: چەوساوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەچەوسانەوە

**چەوساوە** / çewsawe/: ☜ **چەپۆکەسەر**

**چەوسەر** / çewser/: ئاوەڵکار. سەرلەبەیانی بەرەبەیان؛ بەربەیان؛ بوولێڵەی بەیان ☗ هنگام پگاه

**چەوسێنەر** / çewsêner/: ئاوەڵناو. ستەمکار؛ ستەمگەر؛ زاڵم ☗ ستمگر

**چەوکێش** / çewkêş/: ناو. شەن‌کێش؛ شەنەیەکی بە چنگە بۆ وردکەبەرد کۆ کردنەوە ☗ شن‌کش

**چەولگ** / çewlig/: ناو. خیزەلان؛ شوێنێ کە زیخی زۆری لێهەیە 🇮🇷 شنزار

**چەوڵ** / çewł/: ناو. چەوێل؛ چەوەڵ؛ پاشاخۆر؛ قەسەلی ئاخور؛ دەنکە کای درشتی بەرماوی ئاژەڵ لە ئاخوڕدا 🇮🇷 پسماندەی علف درشت در آخور

**چەوڵووک** / çewłûk/: ☜ چەت ـ١

**چەوە** / çewe/: ناو. چاو؛ دیە؛ چەعڤ؛ چەم؛ چەش 🇮🇷 چشم

**چەوەڕنای** / çeweřnay/: چاوگ. خەرەفاندن؛ هۆش لێبڕین 🇮🇷 خرفت کردن

**چەوەڕی** / çeweřî/: ☜ چەشوەڕێ

**چەوەڕیای** / çeweřyay/: چاوگ. خەرەفان؛ هۆش لێبڕان 🇮🇷 خرفت شدن

**چەوەڕێ** / çeweřê/: ☜ چاوەڕوان

**چەوەڵ** / çeweł/: ☜ چەوڵ

**چەوەندەر** / çewender/: ناو. چکنەر؛ چۆنەر؛ چەوەنەر؛ چەنەوەر؛ چۆنەری؛ چنەر؛ سلک؛ سلکێ سۆر؛ شەواندەر؛ پنچکەگیایەکی گەڵا پانی ساقەتە ڕاستی بن ئەستوورە، چەن جۆری هەیە و بنەکەی گۆشتنە و دەخورێ 🇮🇷 چغندر

**چەوەندەربەتیرش** / çewenderbetirş/: ناو. چێشتکە لە چۆنەر و سماق ساز دەکرێ 🇮🇷 آش چغندر و سُماق

**چەوەندەرەکێویلە** / çewenderekêwîle/: ناو. گیایەکە لە گەڵا چۆنەر دەکا و لە دۆکولیوی دەکەن 🇮🇷 گیاهی کوهی

**چەوەنواری** / çewen(i)wařî/: ☜ چاوەڕوانی

**چەوەنۆر** / çewenor/: ☜ چاوەڕوان

**چەوەنەر** / çewener/: ☜ چەوەندەر

**چەویر** / çewîr/: ناو. هەزبێ؛ ئاویشەن 🇮🇷 آویشن

**چەوین** / çewîn/: ناو. گیایەکی بۆنخۆشە 🇮🇷 گیاهی معطر

**چەوێڵ**[1] / çewêł/: ☜ چەوڵ

**چەوێڵ**[2]: پێرۆ. ← چەوتوچەوێڵ/ چەفتوچەوێڵ/ چیلکەوچەوێڵ

**چەهرە** / çehre/: ناو. بیچم؛ کەسم؛ تەرح 🇮🇷 چهره

**چەهڤ** / çehv/: ☜ چاو

**چەهڤنێر** / çehvnêr/: ☜ چاوەڕوان

**چەی** / çey/: ☜ چای[1]

**چەیخوون** / çeyxûn/: ناو. شەوەخوون؛ شەبەیخوون 🇮🇷 شبیخون

**چەییگ** / çeyîg/: ☜ چیاگ

**چی**[1] / çî/: ناوەلکار. بۆ؛ بۆچی ‹چی لوا؟ چی پاسە کەری؟› 🇮🇷 چرا

**چی**[2]: جێناو. چ؛ چە ‹چی دەوێ؟ چی هەیە بۆ فرۆش؟› 🇮🇷 چه چیزی

**ـچی**[3]: پاشگر. ١. خاوەن خدە یا کارێ یان شتێ ‹ڕاوچی؛ تفەنگچی› ٢. فرۆشەر ‹تەنەکەچی› ٣. دروستکەر ‹چایچی؛ قاوەچی› ٤. بەڕێوەبەر ‹کاروانچی؛ کوێستانچی› 🇮🇷 ١تا۴. ـچی

**چیا**[1] / ç(i)ya/: ناو. کێو؛ کێف؛ کەژ؛ کۆ ‹چیا غەملی گیا شین بوو چەمەن ڕازاوە گوڵ پشکووت/ لە هەرلا تێدەفکری سوێسنە و بەیبوون و نەسرینە «حەقیقی»› 🇮🇷 کوه

**چیا**[2]: ☜ چیاگ

**چیاکەن** / ç(i)yaken/: ناو. کۆکەن 🇮🇷 کوه‌کن

**چیاگ** / ç(i)yag/: ناوەلناو. چیا؛ چیاو؛ چایگ؛ چای؛ چایی؛ چەییگ؛ چێیگ؛ چێییگ؛ چێیی؛ سەرتەزێن؛ زۆر سارد 🇮🇷 تَگَری

**چیاگی** / ç(i)yagî/: ناو. ساردی؛ سەردی؛ چایگی 🇮🇷 سردی

**چیالیک** / ç(i)yalîk/: ناو. شلیک؛ توووفەرەنگی 🇮🇷 توت فرنگی

**چیامانی** / ç(i)yamanî/: ناو. ١. چایمانی؛ دۆخی لە بەر سەرما هەموو لەش یا ئەندامێک هاتنە

نـێش ٢. ئارەقـەی لـەش لـە شـەکەتی ■ ١. سرماخوردگی ٢. عرق تن ناشی از خستگی

⊡ **چیامانی کردن**: بـە هـۆی بـای سـارد لـێدان، ئارەقەی لەش پێدا ڕچان و نـەخۆش کـەوتن ■ عرق بر بدن خشکیدن و مریض شدن

**چیاو** / ç(i)yaw/: ☜ **چیاگ**

**چیت** / çît/: ناو. ١. قوماشی ناسک لە بەنی پەموو بە نەخش و نیگاری گوڵ و گیای ڕەنگاوڕەنگەوە ‹من مەتاعم جاوە چاوم! باخەبەر بێ موشتەری/ تا غەزەل سەودا نـەکا لای تـاجیری چـیتی بەقـەم «نالی»› ٢. زیقە و هاوار ٣. قـامیش ■ ١. چیـت ٢. جیغ و داد ٣. نی

**چیتاڵ** / çîtał/: ناو. چێوشەقە؛ دارشەق ■ چـوب با

**چیتپەردە** / çîtperde/: نـاو. چیـغ؛ پـەردەی لـە قامیشی دەوری ڕەشماڵ ■ چیغ

**چیتجا** / çîtca/: ناو. پـەردووە؛ پـەردەی بـووک و زاوا ■ حجله

**چیتغ** / çîtiğ/: ناو. زەل؛ قامیش؛ چیتک ■ نی

**چیتک** / çîtik/: نـاو. ١. قـامیش ٢. هـەر شـتێ لوولەی هەبێ و ناوی هلۆڵ بێ ■ ١. نـی ٢. هـر چیز لولەای شکل میان تُهی

**چیتەڵان** çîtełan/: ناو. قامیشەڵان ■ نیزار

**چیتین** / çîtîn/: ناو،ئاو. چیل ـ چیل ■ خالخالی

**چیجک** / çîcik/: نـاو. سـەری گـوان و مـەمک ■ تُکمەی پستان

**چیچ** / çîç/: ناو. بەچکەی مەل ■ جوجه

**چیچر** / çîçir/: ناو. گیایەکە شیرەکەی لیچقـە ■ گیاهی با شیرەی لزج

**چیچرک** / çîçirk/: نـاو. ١. سیسـرە؛ سیسـرکە؛ سیسـرک؛ مەشـکەدڕە ٢. پارچـە گۆشـتێکی پچووک ■ ١. جیرجیرک ٢. تکه گوشت

**چیچک** / çîçik/: ناو. ١. چیجک؛ سەرگۆی مەمک ٢. نەرمەی گوێ؛ شلکەگوێ ٣. پارچەگۆشتێکی پچووک ٤. میتکەی مێوینە ٥. گوڵی دەشت کە پشکووتبێ ٦. جووجکە مریشک ٧. ☜ **چۆلەکە** ■ ١. تُکمـەی پسـتان ٢. لالـەی گـوش ٣. قطعـە گوشت ۴. چچولـە ۵. گـل کـوهی شـکفتە شـدە ۶ جوجە مرغ ٧. ☜ **چۆلەکە**

**چیچکا** / çîçka/: ☜ **چۆلەکە**

**چیچکان** / çîçkan/: ☜ **چیچکە ـ٢**

**چیچکدان** / çîçikdan/: ناو. جیکڵدان ■ سنگدان

**چیچکە** / çîçke/: ناو. چیچڵـە: ١. شـلکەگوێ ٢. چیچکـان: چینچـک؛ قوونەڵـتس؛ کـاری تررووشـکان ٣. ڕێـزەوڵ؛ وردەنـان ■ ١. لالـەی گوش ٢. چُمباتمە ٣. خُردەنان

**چیچکەسڵاو** / çîçkes(i)ław/: ☜ **چینچکەسڵاو**

**چیچکەمەچان** / çîçkemeçan/: نـاو. گەمەیـەکی منالانە هەڵدەتروشکێن و هەڵدەستنەوە ■ از بازی‌های کودکان

**چیچڵە** / çîçłe/: ☜ **چیچکە**

**چیچە** / çîçe/: نـاو. ١. مـەمک؛ مەمکـە ٢. سەرگۆی مەمک ■ ١. پستان ٢. دکمەی پستان

**چیچەک** / çîçek/: ناو. ١. بشکۆژ؛ چرۆ؛ شکۆفە ٢. خونچە؛ گولووک؛ گولدەم ■ ١. شکوفە ٢. غنچە

**چیچی** / çîçî/: نـاو. ١. چنچـک؛ قوونەڵـتس ٢. مەمک؛ گوان ■ ١. چُمباتمە ٢. پستان

**چیچیلە** / çîçîle/: ناو. نەرمـەگوێ؛ شـلکەگوێ ■ لالەی گوش

**چیچێ** / çîçê/: ناو. تۆڵەکە؛ نانەحاجیلـەگلـەگ ■ پنیرک

**چیخ** / çîx/: نـاو. ١. رووش؛ ڕەوتی رووشـان؛ داڕووشان ٢. ☜ **چیغ** ■ ١. خراش ٢. ☜ **چیغ**

⊡ **چیخ کرن**: رووشاندن ■ خراشیدن

**چیدانە** / çîdane/: نـاو. بالـدارێکی بنەوشـە ■ پرندەای بنفش رنگ

**چیـر**[1] / çîr/: نـاو. ١. بزنەمـەڕەز ٢. چـووک؛ سیرەت؛ ئەندامی زاوزێ نێرینە ≡ ١. بُز مرغُـز ٢. آلت نرینه

**چیر**[2]: ئاوەڵناو. زاڵ؛ قەوەت‌پێ‌شکاو ≡ چیره

**چیرانن** / çîranin/: چاوگ. جیقاندن؛ قیژاندن ≡ جیغ کشیدن

**چیرتـۆق** / çîrtoq/: نـاو. ڕیپـۆق؛ چڵـکی چـاو ≡ ژفک

**چیرچیرۆک** / çîrçîrok/: ناو. چیرۆک ≡ قصه

**چیرڤـان** / çîrvan/: نـاو. جـاڕچی؛ ئاگاکـەر ≡ جارچی

**چیرقاندن** / çîrqandin/: چاوگ. چیرقـین؛ ددان لە چیرەوە بردن ≡ دندان بر هم سایيدن

**چیرقین** / çîrqîn/: ☜ **چیرقاندن**

**چیرک** / çîr(i)k/: ناو. لەتکە؛ لەتـەی هەڵـووچە و سـێو و هـەرمێ و ... (کـە وشـک کراوەتـەوە) ≡ برگه‌ی گوجه و سیب و ...

**چیـرۆک** / çîrok/: نـاو. چیڤـانۆک؛ داسـتان؛ حیکایەت؛ چیرچیرۆک؛ داسانە؛ ڕاز ≡ داستان

**چیرۆکبێـژ** / çîrokbêj/: نـاو. ڕازبێـژ؛ ئـەوەی داستان دەڵێتەوە ≡ داستانگو

**چیرۆکڤـان** / çîrokvan/: نـاو. چیرۆکـوان؛ چیرۆکنووس ≡ داستان‌نویس

**چیرۆکنووس** / çîroknûs/: ناو. نووسەر و هۆنـەری چیرۆک ≡ داستان‌نویس

**چیرۆکوان** / çîrokwan/: ☜ **چیرۆکڤان**

**چیـری** / çîrî/: نـاو. زاڵـی؛ غەڵـەبایی؛ دەس بـە سەرداگری ≡ چیرگی

**چیریلە** / çîrîle/: ☜ **چۆلەکە**

**چیـڕ**[1] / çîř/: نـاو. ١. ددانی گـر ٢. کـاری دان نیشان دان بـە تـووڕەیی ... ≡ ١. عمـل دنـدان خاییدن ٢. چنگ و دندان نشان دادن

⊡ **چیر بونەوە**: زەوق ڕوانین بە تووڕەیی ≡ خیره نگریستن

**چیرەوە بـون**: بـە تـووڕەیی ددان نیشـاندان ≡ دندان خاییدن از خشم

**چیڕ**[2]: ئاوەڵـناو. ١. جیر؛ نەجوو ٢. چەق و نـەپس ٣. *[مەجاز]* چەق؛ سەخت لـە مامەڵـەدا ٤. *[پلار]* ڕیچ؛ تایبەتمەندی زار و ددانی بە دەرەوە ‹ئـەوە چیری یان پێدەکەنی؟!› ≡ ١. غیر قابل جویدن ٢. کشسان ٣. چانەزن ۴. ویژگی کسی که دندان‌هایش در حالت عادی پیداست

**چیڕاندن** / çîřandin/: چاوگ. زیقاندن؛ قیژانـدن ≡ جیق کشیدن

**چیڕت** / çîřt/: ناو. جیقنە؛ ڕیقنە؛ ڕیقنـە؛ پیسـی باڵدار ≡ چلغوز

**چیـڕ ـ چیـڕ** / çîř çîř/: دەنگـەناو. ١. دەنگـی ڕێکخشانی ددانان ٢. دەنگی قەڵەم لە نووسیندا ≡ ١. صدای به هم سایيدن دندان‌ها ٢. صـدای قلـم نی هنگام نوشتن

**چیڕدرێـژ** / çîřd(i)rêj/: ئاوەڵـناو. *[پلار]* زۆربڵـێی لاسار ≡ ژاژخا

**چیڕک** / çîř(i)k/: ناو. بڕەی مافوور کە دەتراشرێ ≡ اضافه نخ قالی که می‌تراشند

**چیڕە**[1] / çîře/: ناو. لۆرک و پەنیری پێکەوە کـولاو ≡ از لبنیات

**چیڕە**[2]: دەنگەناو. دەنگـی قیـژەی کـەو لـە مـار و ڕێوی دیتنا ≡ صـوتی کـه کبـک از وحشـت سـر می‌دهد

**چیڕین** / çîřîn/: چاوگ. ١. لەوەڕان؛ لەوەڕیان ٢. جنێو دان ≡ ١. چریدن ٢. فحش دادن

**چیز** / çîz/: ناو. مۆزەشینە ≡ خرمگس سبزرنگ

**چیزۆ** / çîzo/: ئاوەڵناو. چرووک؛ بێ‌نرخ؛ نەهێژا ≡ بی‌ارزش

**چیشتا** / çîşta/: ناو. نێـوانی بـەیانی و نیـوەڕۆ ≡ چاشت

**چیغ** / çîğ/: ناو. چیخ؛ پەردەی لە قامیش کە بە دەوری ڕەشماڵدا ڕایدەنگێون ‹ماڵمان بەرانبەر، چیغمان جیایی/ حەیفە باڵاگەد شەو وە تەنیایی «فولکلۆر»› ☰ چیغ

⊡ **چیغ کردن**: دەور گرتن؛ دەورەدان ☰ دوره دادن

**چیڤ** / çîv/: ناو. کاری خۆ هەڵکێشان ☰ لاف؛ خودستایی

**چیڤانۆک** / çîvanok/: ☜ **چیرۆك**

**چیڤک** / çîvik/: ☜ **چڤیك**

**چیق** / çîq/: ناو. ١. قاچی جانەوەر؛ لاقی زیندەوەران ٢. قەلەڕەشە ٣. ترس؛ خۆف ☰ ١. پای جانور ٢. کلاغ سیاه ٣. ترس

⊡ **چیق چوون**: تۆقان زراو؛ چوون ☰ زهره‌ترک شدن

**چیقاڵ** / çîqał/: ناوەڵناو. [بلار] کز؛ لەجەر؛ لەڕ و لاواز ☰ لاجون

**چیقڵ** / çîqił/: ☜ **جیقڵ**

**چیقڵدانە** / çîqiłdane/: ☜ **جیقڵدان**

**چیک** / çîk/: ناو. ١. تانەی سەر چاو؛ لەکەی بان چاو ٢. بسکی لاجانگ ٣. جووچکی مەل ٤. ☜ **چۆلەکە** ☰ ١. لکه‌ی چشم ٢. موی شقیقه ٣. جوجه ۴. ☜ **چۆلەکە**

**چیکلە** / çîkle/: ☜ **چیلکە ـ١**

**چیکڵ** / çîkił/: ☜ **جیقڵ**

**چیکڵدانە** / çîkiłdane/: ☜ **جیقڵدان**

**چیکن** / çîkin/: ناو. چیکەنە؛ ئامرازی پەمۆ پاک کردن ☰ ابزار پنبه پاک‌کنی

**چیکنای** / çîknay/: چاوگ. جیکە‌ـجیک کردن ☰ جیک ـ جیک کردن

**چیکنە** / çîkne/: ناو. چیکەنە؛ درووونی ورد؛ دروومانی ورد ☰ دوخت و دوز بسیار ریز

**چیکەنە** / çîkene/: ناو. ١. ☜ **چیکنە** ٢. پەمۆ لە چیکنەدان ☰ ١. ☜ **چیکنە** ٢. عمل پاک کردن پنبه

**چیگنە** / çîg(i)ne/: ☜ **چنگنە ـ١**

**چیل**[1] / çîl/: ناو. ١. ماکەو؛ کەوی مێ ٢. گیا و پووشی ناو کورتان ٣. فێڵ؛ گەڕ ‹پوڕ چیل و چەپی، خەراب و خواری «هەژار، مەموزین»› ٤. پەرژین ٥. جووچکی باڵندە ☰ ١. ماده کبک ٢. آنچه از کاه و گیاه که در پالان ریزند ٣. حیله؛ مکر ۴. خاربست ۵. جوجه‌ی پرنده

**چیل**[2]: ناوەڵناو. ١. بازگی خاڵدار ٢. زۆر سپی؛ فرەچەرمگ ☰ ١. ابلق ٢. کاملاً سفید

**چیلان** / çîlan/: ناو. ١. ئەنگوچکە سۆرانی باریک ٢. قوفڵ و کلیل ☰ ١. آستین بلند و باریک لباس کردی ٢. قفل و کلید

**چیلانگەر** / çîlanger/: ناو. ١. قولفساز؛ قفڵساز؛ کلیلساز ٢. گاوکەر؛ ئەوی چینییە شکاو لێک دەنێتەوە ☰ ١. قفل‌ساز ٢. چینی بندزن

**چیلک** / çîl(i)k/: ناو. ١. میتکە؛ چیچک ٢. گۆپکەی گوان و مەمک ☰ ١. چچوله ٢. تکمەی پستان

**چیلکە** / çîlke/: ناو. ١. چیکلە؛ چیلە؛ چێلک؛ چێلگ؛ لقی باریک و کورت ٢. گۆپکەی سەر گوان و مەمک ☰ ١. شاخەی کوتاه و باریک درخت ٢. تکمەی پستان

⊡ **چیلکە لە پیسایی وەردان**: [کینایە] چوکڵە تێ خستن؛ زۆر دووپات کردنەوەی قسە یا کارێکی نابەجێ کە زیانی زیاتر بکات ☰ تکرار کار یا سخن خطا کە آثار زیانبار آن را بیشتر کند

**چیلکەدار** / çîlkedar/: ☜ **چوکڵە**

**چیلکەوچاڵ** / çîlkewçał/: ناو. پووشوپەلاش؛ پڕوپووش ☰ خس و خاشاک

**چیلکەوچەوێڵ** / çîlkewçewêł/: ناو. وردکە

ئێزینگ ☰ خُرده هیزم

**چیله** / çîle/: ناو. ۱. ☜ **چیلکـه ـ۱** ۲. پـووش و وردەداری ئاگر پێکـردن ۳. پـەرژین ☰ ۱. ☜ چیلکه ـ۱ ۲. افروزنه ۳. خاربست

**چیلەک** / çîlek/: ناو. چێل؛ مانگا ☰ ماده گاو

**چیلەوچەوتە** / çîlewçewte/: ناو. سیله و چەوتە؛ کاری بە وردی ڕوانین و نیشان لێ‌گرتن ☰ عمل دقیق نگریستن و نشانه گرفتن

**چیلێر** / çîlêr/: ناو. بەشێ لە کەرستەی بـاگۆڕێن کە ئاوی نێو دەزگاکە سارد دەکاتەوە ☰ چیلر

**چیڵ** / çîł/: ناو. ماکەو؛ کەوێ مێ ☰ ماده کبک

**چیم** / çîm/: ناو. ۱. قوڕی هەڵقەندراو لە مێـرگ ۲. بەلەک؛ پووز ☰ ۱. گِـل برداشـته شـده از کنـار چشمه و جویبار ۲. ساق پا

**چیمانی** / çîmanî/: ناو. هەگبە؛ چەنتەی سـەفەر ☰ ساک یا چمدان سفر

**چیمک** / çîmik/: ناو. چینە؛ دانێ پەلەوەر دەیخوا ☰ چینه

**چیمکـوت** / çîmkut/: ئاوەڵـناو. قـورس و قـایم ‹دایکوتا باکوت و سەرما چیمکوت / بیری بزنی بـوو، کە چی کوت؟ چیم کـوت «وەفـایی»› ☰ قُـرص و مُحکم

**چیمکۆ** / çîmko/: ناو. ڕووکێش ☰ روکش

**چیمەن** / çîmen/: ناو. مێرگ ☰ مرغزار

**چیمـەنتۆ** / çîmento/: نـاو. چەمـەنتۆ؛ سمنـت؛ سیمان ☰ سیمان

**چین**[۱] / çîn/: چاوگ. چوون؛ ڕۆیشتن ‹زەلزەلـەی زاری زەنان بـێ شـەوهەر / مـەچین وە پـای چـەرخ چەواشەی داوەر «شانامەی کوردی»› ☰ رفتن

**چین**[۲]: ناو. ۱. لا؛ تۆ؛ توێ؛ ڕوو یان پۆشەنێ کە لە ڕوویەکی‌تر‌ەوە زۆر نزیک یان پێـوەی چەسـپاوە ۲. بـەرەباب ۳. ڕیـزی دیـوار ٤. تاقمێـک لـە خەڵک بە تایبەتمەنـدی کـار یـان کۆمەڵایـەتی هاوبەشەوە ‹چینـی کرێکـار› ٥. چـەخس؛ تـان؛ دەورێکی لێدان ☰ ۱. لایه ۲. نسل ۳. ردیف دیـوار ۴. قشر ۵. یک فصل کتک

• **چین**[۳]: پاشەوشە. ۱. ☜ **ـ بژێر ـ۱** ۲. ☜ **ـ چن**

**چیناوی** / çînawî/: ئاوەڵناو. ۱. بەتوێ؛ لا لەسـەر لا ۲. *[کنایە]* بەنرخ؛ هێژا ☰ ۱. چیندار؛ چین‌ـچـین ۲. گرانقیمت

**چینایەتی** / çînayetî/: ناو. دۆخی چـین ـ چـین بوون ☰ طبقاتی

**چینچـڕووک** / çînç(i)ṙûk/: نـاو. چنچـڕۆک؛ چەنچڕۆک ☰ چنگال پرنده و درنده

**چینچـک**[۱] / çînçik/: نـاو. ۱. باپشـکێو؛ سینچکەسلاوە؛ قنچکەسـلام ۲. زیپکـەی سـەر پێست ۳. نەرمەی گـوێ ٤. پارچـە گۆشـتێکی پچووک ٥. قوونەڵتس ☰ ۱. گُل‌مژه ۲. جوش بدن ۳. لالەی گوش ۴. قطعه گوشت ۵. چُمباتمه

**چینچک**[۲]: ئاوەڵناو. کەمووکە ☰ اندک

**چینچکان** / çînç(i)kan/: ☜ **چنچکان**

**چینچکە** / çînç(i)ke/: ناو. قونچکە؛ زیرک؛ زیپکە ☰ جوش پوست

**چینچکەسلاو** / çînç(i)kes(i)ław/: ناو. چیچکەسلاو؛ باپشـکێو؛ بووکـک؛ دیقلـۆک؛ زیتکەسـلام ☰ سندەسلام

**چینچکەسڵاوە** / çînç(i)kes(i)ławe/: ناو. باپشکێو ☰ گُل‌مژه

**چین ـ چین** / çîn çîn/: ئاوەڵـناو. ۱. لا لەسـەرلا ‹مەشنیە چین ـ چین چنوور جە کـاوان / تـۆ خـودا ماتەم بەر هاژەی وەفراوان «مەولەوی»› ۲. خاڵـدار ☰ ۱. چین‌ـچین ۲. خالدار

**چینچینک** / çînçînik/: ناو. نوقورچـک؛ قـورنج؛ قورینجان؛ کورنیشک ☰ نیشگون

**چینخ** / çînx/: ناو. ۱. چیـغ ۲. بـرینی پـووک و پێست ☰ ۱. چیغ ۲. زخم لثه و پوست

**چیندار / çîndar/**: ئاوەڵناو. چین ـ چین؛ بە چین و گنج ☰ چیندار

**چینک / çînk/**: ناو. زولف؛ پرچی سەر لاجانگ ☰ زُلف

**چینکۆ / çînko/**: ناو. چیمکۆ ☰ روکش

**چینگ ـ چینگ / çîng çîng/**: دەنگەناو. زرنگەزرنگی خشڵ ☰ صدای به هم خوردن زیورآلات

**چینوماچین / çîn û maçîn/**: ناو. مریشکەتارانی؛ مریشکەهندی ☰ مُرغ شاخدار

**چینە / çîne/**: ناو. ۱. چین؛ ڕیزێک لە دیوار ۲. چیمک؛ دانێ پەلەوەران دەیخۆن ۳. کاری هەڵگرتنەوەی دەنک بە دندووک ٤. قاش؛ براوێک لە میوەی بێستان ☰ ۱. ردیفی از دیوار ۲. چینه ۳. عمل دانه برچیدن مرغان ۴. قاچ

▣ **چینە کردن**: بە پێ خۆڵ و پووش وە لا دان و بە دندووک دان هەڵگرتنەوەی پەلەوەر ‹پێکەوە چینە بکەین لەو پەینە/ بۆی سەنێر مەڵهەمی بیر و زەینە «سوارە»› ☰ چینه کردن

**چینەدان / çînedan/**: ناو. جیدانە؛ سیکەتۆرە؛ سیقەتۆرە ☰ ژاغر

**چینەدوو / çînedû/**: ☜ **جیقڵدان**

**چینی[1] / çînî/**: ناو. فەخفووری؛ جۆرێ سواڵەتی هەرە باش، بریقەدار و ساف و لووس کە ئیرباری لێ دروست دەکرێ ☰ ظروف چینی

**چینی[2]**: ئاوەڵناو. پێوەندیدار یان سەر بە وڵاتی چین ☰ چینی

**چیوچیوە / çîwçîwe/**: ناو. دارێکی دوو پەلە لە هەر دوو سەری باگردێن ڕادەکرێت ☰ چوب دو سر غلتک بام

**چیوێک / çîwîk/**: ☜ **چۆلەکە**

**چیە / ç(i)ye/**: ناو. دوندی کێو ‹چیەکان دۆڵدێ› ☰ قلەی کوه

**چیەر / ç(i)yer/**: ناو. دەم؛ دەڤ؛ زار ☰ دهان

**چیەرگ / ç(i)yerg/**: ناو. برینگ ☰ دوکارد

**چیەم / ç(i)yem/**: ☜ **چاو-۱**

**چیەمچارکی / ç(i)yemçarkî/**: ناو. تۆلازی ☰ چشم‌چرانی

**چیەمدەژین / ç(i)yemdejîn/**: ناو. چاوئێشە ☰ چشم‌درد

**چیەمەنتۆ / ç(i)yemento/**: ناو. سمیت؛ سمنت ☰ سیمان

**چییە / çîye/**: ☜ **چەس**

**چییەتی / çîyetî/**: ناو. سەرجەم ئەو تایبەتمەندییانە کە شتێک دەناسێنێ و دەری دەخا چییە ☰ ماهیّت

**چێ[1] / çê/**: ئاوەڵناو. ۱. بەدەست و برد و کاری ۲. باش و چاک ☰ ۱. کاری ۲. خوب

▣ **چێ کرن**: ۱. دروست کردن؛ سازدان ۲. کار پێکهێنان ☰ ۱. درست کردن ۲. انجام دادن

**چێ[2]**: ئاوەڵکار. ئێرە؛ ڤر ☰ اینجا

**چێبوو / çêbû/**: ئاوەڵناو. خوڵقاو؛ دروستکراو ☰ آفریده

**چێچەقولێ / çêçequlê/**: ناو. قولان؛ کایەی دوو تیمی لە سەر یەک پێ ‹یا چێچەقولێ یا خۆ چاوشارکێ/ گۆرانی وتن یا خۆ هەڵپەڕکێ «قانع»› ☰ بازی گروهی لَی‌لَی

**چێچێ / çûçê/**: نانێ چووچک ☰ پنیرک

**چێڕ[1] / çêr/**: ناو. ۱. ژێر؛ بن ‹چێڕوو زەمینی؛ ئا چێرەیە گێلە› ۲. ☜ **چێڵ** ۳. دۆست و ئاشنا ٤. غەیبەت ☰ ۱. زیر ۲. ☜ **چێڵ** ۳. دوست و آشنا ۴. غیبت

**چێڕ[2]**: ئاوەڵناو. زاڵ؛ دەسەلاتدار ☰ چیره

**چێڕ[3]**: ئاوەڵکار. ئەنەچێڕ؛ چێرەرە؛ ژێر؛ بن ‹ئەر چێر زەمین بۆ، بوەزش سەر زەمین/ جوابم مەکەرە، تۆ حیسامەدین! «مەلا حەسەن دزلی»› ☰ زیر

**چێرڤان / çêrvan/**: ناو. کەرەلیاس؛ ڕاگەیێنەر؛ جارچی ☰ جارچی؛ مُنادی

**چێرگ / çêrig/**: ناو. ۱. ☜ **چرگ** ۲. برینگ ☰ ۱. ☜ **چرگ** ۲. دوکارد

**چێرومێر / çêr û mêr/**: ناو. دۆست و هەوال؛ ئاشنا و برادەر ☰ دوست و آشنا

**چێرە[1] / çêre/**: ناو. ۱. لەوەڕ؛ گیای خواردنی مالات ۲. ڕوومەت؛ دەموچاو ۳. قەرەبوو ٤. ڕەنگی ئالی کاڵ ٥. برینگ ☰ ۱. علوفەی دام ۲. چهره ۳. تلافی ۴. رنگ صورتی ۵. دوکارد

**چێرە[2]**: ئاوەڵناو. ۱. زاڵ؛ دەست بە سەردا ڕۆیشتوو ۲. چێرەیی؛ بە ڕەنگی ئالی ئاچخەوە ☰ ۱. چیره ۲. صورتی

**چێرە[3]**: دەنگەناو. چیرە؛ قیژ و واژی کەو لە وەختی مار و ڕێوی دیتندا ☰ جیغ و داد کبک هنگام مشاهدەی مار و روباه

**چێرەیی[1] / çêreyî/**: ناو. پەمەیی؛ ئاچخ؛ حویل؛ ڕەنگی ئالی کاڵ ☰ صورتی

**چێرەیی[2]**: ئاوەڵناو. پەمەیی؛ بە ڕەنگی ئالی کاڵەوە ☰ صورتی

**چێری / çêrî/**: ناو. لەوەڕگە ☰ چراگاه

**چێریاندن / çêryandin/**: چاوگ. لەوەڕاندن ☰ چراندن

**چێرین / çêrîn/**: چاوگ. ۱. لەوەڕان؛ گیا خواردنی ئاژەڵ ۲. لەوەڕاندن ☰ ۱. چریدن ۲. چراندن

**چێڕ / çêř/**: ناو. ۱. تێر؛ جەوالی دووتایی ۲. جنێو؛ سخێف؛ دژمان ☰ ۱. خُرجین بزرگ ۲. دُشنام

**چێڕگ / çêřig/**: ☜ **چرگ**

**چێڕنای / çêřnay/**: چاوگ. چێڕەوە بوون لە ئاخاوتندا ☰ غضب کردن در بحث

**چێڕەخەر / çêřexer/**: ناو. ڕایەخ؛ هەر شتێ بۆ ڕاخستن دەشێ (وەک: بەڕە و مافوور و حەسیر) ☰ زیرانداز

**چێژ[1] / çêj/**: ناو. چاژ؛ چاش؛ چەژە؛ چەش؛ چێژکە؛ چێشکە؛ چێژە؛ تام ☰ مزّە

• **چێژ[2]**: پاشەوشە. چێژەر ‹سەختیچێژ› ☰ ـ چش

**چێژان / çêjan/**: ☜ **چەشتن**

**چێژتن / çêjtin/**: ☜ **چەشتن**

**چێژکە / çêjke/**: ☜ **چێژ[1]**

**چێژە[1] / çêje/**: ☜ **چێژ[1]**

⊡ **چێژە دانان**: چەشکە دانان بۆ نێچیر ☰ چشته گذاشتن برای شکار

**چێژە[2]**: ئاوەڵناو. چێشکەخواردوو ☰ چشتەخور

**چێژەتوند / çêjetund/**: ئاوەڵناو. چێژەتێژ؛ کەسکوون ☰ تُندمزه

**چێژەتێژ / çêjetêj/**: ☜ **چێژەتوند**

**چێژەخۆش / çêjexoş/**: ئاوەڵناو. تامین؛ بەتام؛ تامدار ☰ خوشمزه

**چێژەناخۆش / çêjenaxoş/**: ئاوەڵناو. تامسار ☰ بدمزه

• **چێژی / çêjî/**: پاشەوشە. چێژان ‹خویچێژی› ☰ ـ چشی

**چێژیلە / çêjîle/**: ☜ **چۆلەکە**

**چێش[1] / çêş/**: جێناو. چی؛ چە ☰ چه

**چێش[2]**: ئامراز.مەگیرە؛ تەمەز ‹مەیلت ئارەزووی ئەغیار کەردە بێ/ چێش خامەکەت نام مەعدووم بەردە بێ «مەولەوی»› ☰ چه

**چێشت / çêşt/**: ناو. ۱. ئاش؛ پێخۆری لە سەر ئاگر کولاو ۲. خۆراک؛ خواردن ۳. تێشت؛ بەرقلیان؛ نانی بەیانی ☰ ۱. آش ۲. غذا ۳. صُبحانه

⊡ **چێشت کردن**: ☜ **چێشت لێنان**

**چێشت لێنان**: چێشت کردن؛ دروست کردنی چێشت ☰ غذا درست کردن

**چێشتان / çêştan/**: ناو. چاشت؛ چاشتەنگاو؛ نێوان

بەیانی و نیمەڕۆ ☰ چاشت

**چێشتانان** / çêştanan/: ناو. دەمی بەر لە نیوەڕۆیان ☰ چاشتگاه

**چێشتانە** / çêştane/: ناو. بەخشش لە پاداشی کاری چاکدا ☰ انعام

**چێشتاو** / çêştaw/: ناو. ١. کاری ئاو دانی مەڕ لە نێوان بەیانی و نیوەڕۆدا ٢. ئاش؛ تەڕەچێشت ☰ ١. عمل آب دادن چاشت هنگام رمه ٢. آش

**چێشتخانە** / çêştxane/: ناو. خواردنگە؛ خوارنگەه؛ ئاشخانە؛ ئاشخان؛ ڕستووران؛ شوێنی دامەزراو بۆ خواردن و خواردنەوەی مشتەرییان ☰ غذاخوری

**چێشتکوڵێن** / çêştkułên/: ناو. چێشتەخۆشە؛ چێشتەخۆشکە؛ بەهارات ☰ ادویه

**چێشتکەر** / çêştker/: ناو. ئاشپەز؛ چێشتلێنەر ☰ آشپز

**چێشتکەری** / çêştkerî/: ناو. ئاشپەزی ☰ آشپزی

**چێشتلێنەر** / çêştlêner/: ناو. ئازپێش؛ ئاشپەز؛ چێشتکەر ☰ آشپز

**چێشتن** / çêştin/: ☜ **چەشتن**

**چێشتە**[1] / çêşte/: ناو. چەشە بۆ نێچیر ☰ چشته

**چێشتە**[2]: ئاوەڵناو. چەشەخواردوو ☰ چشته‌خوار

**چێشتەخۆر** / çêştexor/: ☜ **چەشتەخۆرە**

**چێشتەخۆرە** / çêştexore/: ☜ **چەشتەخۆرە**

**چێشتەخۆشکە**/ çêştexoşke/: ناو. ١. چێشتەقوڵەی منالان ٢. بەهارات؛ ئەدوا؛ هەزوێلە ☰ ١. توشەی کودکان ٢. ادویه

**چێشتەخۆشە** / çêştexoşe/: ناو. چێشتەخۆشکە؛ چێشتەکوڵێن؛ بەهارات؛ ئالات و زەردەچێوە ☰ ادویه

**چێشتەخەو** / çêştexew/: ناو. خەوی چێشتانا؛ خەوی بەر لە نیوەڕۆیان ☰ قیلوله

**چێشتەقوڵێ** / çêştequlê/: ناو. *[منداڵانە]* ماشک؛ چێشتی منداڵان لە کایەدا ☰ غذا در ادبیات کودکان

**چێشتەقوڵە** / çêştequłe/: ناو. چێشتەقوڵی؛ خواردنێ کە منالان لە ماڵەوەی دێنن و پێکەوە دەیخۆن ☰ توشەی کودکان

**چێشتەقوڵی** / çêştequłî/: ☜ **چێشتەقوڵە**

**چێشتەکوڵێن** / çêştekułên/: ☜ **چێشتەخۆشە**

**چێشتەنگاو** / çêştengaw/: ناو. قاوەڵتوون؛ وەختی بەر لە نیوەڕۆ ‹بەلام تا خولقی نەکا چێشتەنگاو/ نایەتە ناو دێ پرشنگی هەتاو «گۆران»› ☰ چاشت هنگام

**چێشتەنگاوان** / çêştengawan/: ئاوەڵکار. دەمی بەر لە نیوەڕۆ ☰ چاشتگاه

**چێشتەنوێژ** / çêşten(i)wêj/: ناو. نوێژی سوننەت لە نێوان بەیانی و نیوەڕۆدا ☰ نماز سُنت چاشت

**چێشتیر** / çêştîr/: ☜ **چوێشتیر**

**چێشکە** / çêşke/: ناو. ١. ☜ **چێژ**[1] ٢. ☜ **چۆلەکە**

**چێشکەخواردوو** / çêşkex(i)wardû/: ☜ **چەشتەخۆرە**

**چێقنای** / çêqnay/: چاوگ. زیقاندن ☰ جیغ و داد کردن

**چێکرۆک** / çêk(i)rok/: ئاوەڵناو. دروستکراو ☰ ساخته شده

**چێکەر** / çêker/: ناو. چێکر؛ سازکەر؛ سازێنەر ☰ سازنده

**چێکە** / çêke/: ☜ **چێگە**

**چێگە** / çêge/: ئاوەڵکار. چێکە؛ لێرە ☰ اینجا

**چێل**[1] / çêl/: ناو. ١. گاشەبەرد؛ تەلەسەنگ؛ تاوێرەبەرد؛ کەڤری مەزن ٢. پەرچینی لە دڕک و داڵ سازکراو ٣. جووچکی باڵندە ☰ ١. سنگ بزرگ ٢. خاربست ٣. جوجەی پرنده

**چێل**[2]: ئاوەڵناو. خاڵ-خاڵ ☰ خال-خالی

**چێلەک** / çêlek/: ☜ **چێڵ**[1]

**چێلـەمێ** / çêlemê/: نـاو. شەمشـەمەکوێرە؛ چەکچەکی ☲ خُفاش

**چێلە** / çêle/: ناو. بێچوو؛ فرزەند ☲ فرزند

**چێلی** / çêlî/: ناو. جووچکەی مەل ☲ جوجه

**چێڵ**[1] / çêł/: ناو. چێر؛ چێلەک؛ مانگا ‹سـۆفی بـە سـەر و ڕیشـی بـەم خەرقـەیی سەردۆشـی/ چەنـد چێلـەگەل و بزنەگـەل و مێگـەلی دۆشـی «حـاجی قادر»› ☲ ماده گاو

**چێڵ**[2]: ئاوەڵناو. خوار؛ لار ☲ کج

**چێڵک** / çêłik/: ناو. ١. ☜ **چیلکـە ـ١** ٢. ماکـەو ٣. تەوەنــە؛ تەبەنــە؛ دەرزی گــەورە ☲ ١. ☜ **چیلکە ـ١** ٢. ماده کبک ٣. جوالدوز

**چێڵکڕ** / çêłkiř/: نـاو. مـەلی کڕکـەوتوو لـە سـەر هێلکە ☲ پرندەی کرچ روی تخم

**چێڵگ** / çêłig/: ☜ **چیلکە ـ١**

**چێم** / çêm/: ☜ **چاو**

**چێمک** / çêmik/: ئاوەڵناو. جمک؛ دوانە؛ لفەدوانـە ☲ دوقلو

• **چێن** / çên-/: پاشەوشە. چێنەر؛ ـ چن ‹تۆمچێن› ☲ ـ افشان؛ ـ پاش

**چێندران** / çênd(i)ran/: ☜ **چێنران**

**چێندراو** / çênd(i)raw/: ئاوەڵناو. چێنراو؛ چاندراو؛ چناو ☲ کاشتەشدە

**چێنران** / çênran/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //چێنرای؛ دەچێنرێـی؛ بچێنـرێ// چێنـدران: ١. نـران ٢. وەشیان ☲ ١. کاشته شدن ٢. افشانده شدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: چێنـراو/ چـاوگی نـەرێنی: نەچێنران

**چێنراو** / çênraw/: ☜ **چێندراو**

**چێنک** / çên(i)k/: نـاو. نـاوکی میـوە ☲ هسـتەی میوە

**چێنکە** / çênke/: نـاو. پەڵـە و سـەوزایی لـە نـاو پووش و پاری وشکدا ☲ گیاه سـبزه مانـدەی لای خس و خار

**چێنی** / çênî/: ناو. بەڵمەگۆشت؛ پارچەیـەک لـە گۆشت ☲ لُخمه گوشت

**چێو** / çêw/: ناو. ١. چۆ؛ چوو؛ بەشی تۆکمەی دار و دارچک کە بەتایبەت کۆتەرەکەی پێک دێنـێ ‹چێوی گـوێز زۆر بەنرخـە› ٢. داردەسـت ‹چێـو هەڵـگری، سـەگ دز دیـارە «پەنـد»› ٣. ئـامراز؛ ئەسپاب ٤. چاو ☲ ١. چوب ٢. چوبدسـتی ٣. ابـزار ۴. چشم

▣ **چێو خواردن**: کوتەک خواردن ☲ کتک خوردن

**چێو لـە تـاریکی کوتـان**: *[کنایـە]* پـەڵ بـە دارا خستن؛ بەرد لە هەوا خستن؛ لە ناچاری و بێ هیوا، لەسەر خودا کارێـک کـردن ☲ تیـر بـە تاریکی انداختن

**بوونە چێو دەس لوتی**: *[مەجاز]* ڕەق بردنـەوە؛ لـە سەرمان هەڵلەرزان ☲ یخ زدن از سرما

**چێوار** / çêwar/: ☜ **چۆدار**

**چێواری** / çêwarî/: نـاو. چۆداری؛ کـاری کـڕین و فرۆشتنی ئاژەڵ و وڵاخ ☲ چوبداری

**چێوبەس** / çêwbes/: ناو. چێوبەسـت؛ داربەسـت؛ داربەس؛ پێکهاتەیەک لـە مێلـەی ئەسـتوونی و ئاسۆیی پێکەوە بەستراو بۆ لە سەر وێستان و کار کردن لە سەر دیـوار، درگـا و پەنجـەرە و... ☲ داربست

**چێوبەست** / çêwbest/: ☜ **چێوبەس**

**چێوپاسـاری** / çêwpasarî/: نـاو. گوێسـوانە؛ داری ڕەتبووی لێواری سـەربان ☲ الـوار بیـرون زده از لبەی بام

**چێـوپزگ** / çêwp(i)zig/: نـاو. ڕوەکێکــە وەک کەنگر، ساقەکەی بە وشککراوی بـۆ دەرمـانی نـەخۆش پـزگ دەکرێتـە مـل پـەز ☲ گیـاهی دارویی

**چێوپـەردە / çêwperde/**: نـاو. میلەیـەکی درێـژ پەردەی پێوە هەڵدەواسن ☰ چوب پردە

**چێوپەمە / çêwpeme/**: ناو. چۆپەمـە؛ چووپەمـە؛ هەودەل؛ تەپەدۆر: ١. تۆکڵەی بـڕێ داری وەک بەڕوو کە پاش وشـک بوونـەوە، نـەرم و پیـف و سووک هەڵدەگەڕن و کون ـ کـون دەبنـەوە ٢. تیکەیەک لەو چێوە کـە بـۆ سـەرگرتنی بـوتری دەبێ ☰ ١و٢. چوبپنبە

**چێوتە پانە / çêwtepane/**: ناو. دارتەپان؛ دارێکـە لـە کەرەسـتەی جۆلاییـدا ☰ چـوبی در دسـتگاه جولایی

**چێوجەلـە / çêwcele/**: نـاو. ئـامرازی ئـازار دانی زیندانی (ئەو چێوە دەخەنە نیوان قامکانی و ڕێکـی دەکوشن) ☰ از ابزار شکنجه

**چێودار / çêwdar/**: ☜ **چۆدار**

**چێودان / çêwdan/**: ☜ **چاودار-١**

**چێوراندن / çêwirandin/**: چاوگ. ١. وەرگێـڕان؛ پاچڤە کرن؛ تەرجەمـە کـردن ٢. دەرکـردن؛ وە دەر نان ☰ ١. ترجمە کردن ٢. راندن

**چێورکـار / çêwirkar/**: نـاو. وەرگێـڕ؛ پاچڤـەکار؛ تەرجومان ☰ مُترجم

**چێوشەق / çêwşeq/**: ☜ **چێوشەقە**

**چێوشەقە / çêwşeqe/**: ناو. چێوشـەق؛ دارشـەق؛ شەق؛ وەلـەک؛ دارهـەنگڵ؛ داری بـن هەنگڵـی لاقشکاو ☰ عصا

**چێوک / çêwik/**: ناو. دەمـاری تـووتن ☰ رگبـرگ توتون

**چێوکار / çêwkar/**: ☜ **چۆکار**

**چێوکاری / çêwkarî/**: ناو. ١. کار کردن بـە چێـو بەتایبـەت کـاری ڕازێنـەیی و جوانکـاری ٢. چێوکوتان؛ لێدانی لـە پەسـتا بـە دار ☰ ١. کـار هنری با چوب ٢. چوبکاری

**چێوکوت / çêwkut/**: ناوەڵناو. ١. تێلاکوت؛ بە تێلا لێـدراو ٢. *[کنایە]* بـە زۆر تـێ ئـاخنراو ☰ ١. چوبکاریشدە ٢. بە زور فروشدە

**چێوکوتان / çêwkutan/**: ☜ **چێوکاری**

**چێولیباسی / çêwlîbasî/**: ☜ **چاکلا**

**چێوەتەقێ / çêweteqê/**: ناو. چێوەزمە؛ کاری دار بە عەرزدا گەڕاندنی کوێر بۆ ڕێگە تاقی کردنـەوە ☰ عمل عصا زدن نابینا

**چێوەچزە / çêweç(i)ze/**: ناو. ↓

▣ **چێوەچزە دان**: ئازار دان ☰ اذیت کردن

**چێوەختێ / çêwex(i)tê/**: ناو. چوکڵەختێ؛ کـاری چوکڵە کردنە ناو شتێکدا ☰ کار چـوب در چیـزی کردن

**چێوەخرتە / çêwexirte/**: ناو. ↓

▣ **چێوەخرتـە دان**: دواندن ‹هەرچی چێوەخرتەمان دا قسەی نەکرد› ☰ سربەسر گذاشتن و بە حـرف آوردن

**چێـوەخرتێ / çêwexirtê/**: نـاو. کـاری چێـو خشاندن لە جێگای تەنگ و نچیر دەرپەڕانـدن ☰ عمل بیرون کشاندن شکار از سوراخ با چوب

**چێوەزمـە / çêwez(i)me/**: نـاو. ١. زوقمـی زۆر سەخت ٢. ☜ **چێوەتەقێ** ☰ ١. سرمای شدید ٢. ☜ **چێوەتەقێ**

**چێوەسان / çêwesan/**: ناو. ١. بڕبەندی دار و سم تاشین ٢. کەڵپێکی بەراز لە پەنا شـفرەوە ☰ ١. سوهان چوب و سم ٢. یکی از دندانهای گراز

**چێوەڵی / çêweľî/**: ناوەڵکار. لەمەوپێش؛ بـابردوو؛ ڕابردە ☰ قبلاً

**چێوی / çêwî/**: ناوەڵناو. دارین؛ چێـوین؛ چووینـە ☰ چوبین

**چێوین / çêwîn/**: ☜ **چێوی**

**چێیگ / çêyig/**: ☜ **چیاگ**

**چێیی / çêyî/**: ☜ **چیاگ**

**چێییگ / çêyîg/**: ☜ **چیاگ**

# ح

**ح** / ĥ/: پیت. نیشانەی هەشتەمین پیتی ئەلفوبێتکەی زمانی کوردی ☰ ح؛ نشانەی هشتمین حرف الفبای زبان کُردی

**ح** / ĥi/: ناو. حیٚ؛ ناوی هەشتەمین پیتی ئەلفوبێتکەی زمانی کوردی ☰ ح

**حا** / ĥa/: دەنگ. ١. وشەی سەر سوورمان ‹حا لەو گشتە جوانییە!› ٢. وشەی لێخوڕین و دەنگ دانی گا و وڵاخ ☰ ١. کلمەی تعجب ٢. واژەی راندن گاو و الاغ

**حاپۆل** / ĥapol/: ☜ **حەپۆل**

**حاپـوول** / ĥapûl/: ناو. ١. بـواری کـەللا لـە کەللایێنـدا؛ شـوێنەهەڵـمات لـە هەڵـماتانا ٢. هەنگاوی گەورە لە گەمـەدا ‹حاپوول بنیٚ ئەوسا بیهاویٚ!› ☰ ١. مسیری کە تیلـە در تیلـەبـازی طـی می‌کند ٢. گام بزرگ در بازی

**حاپوولک** / ĥapûlik/: ناو. چـەل؛ نـۆرە؛ نۆبـە لـە کایەدا ‹حاپوولکی تۆیە کایە بکە!› ☰ نوبت در بازی

**حاتۆر** / ĥator/: ناو. حەتار؛ داری ئەستووری گـێچ کوتان ☰ چُماق گچ‌کوبی

**حاتە** / ĥate/: ناو. گەمارۆ؛ ئابلۆقە ☰ مُحاصره

**حاجەت** / ĥacet/: ناو. هەجەت؛ هەژەت: ١. دەفـر و دۆڵە ٢. ئەسـپابی مـاڵ ٣. ئـامرازی کـار ☰ ١. ظرف و ظروف ٢. وسایل منزل ٣. ابزار کار

◘ **حاجەت شۆردن**: دەفر شتن ☰ ظرف شستن

**حاجی**[1] / ĥacî/: ناو. هەجی؛ کەسیٚ کە بۆ زیـارەت چووبێتە ماڵی خـودا ‹بـە دڵخۆشـی و بـە تـارەک/ حاجی حەجتان موبارەک «گۆران»› ☰ حاجی

▪ **حاجی**[2]: پاشەوشە. ڕێزناویٚ بۆ پیـاوانی موسوڵـمان ‹باوەحاجی؛ مامەحاجی› ☰ حاجی

**حاجی‌ئاغا** / ĥacî'ağa/: ناو. ١. نازنـاوی پیـاوی حەجڕۆیشتوو ٢. نازناوی پیاوی بەتەمەن ☰ ١و٢. حاج‌آقا

**حاجی‌بادام** / ĥacîbadam/: ناو. جـۆریٚ هەڵـوا ☰ نوعی حلوا

**حاجی‌بـایف** / ĥacîbayif/: نـاو. حـاجی‌بـایڤ؛ حاجی‌بایەف؛ هاجی‌بایف: ١. جـۆریٚ بـادامی ورد ٢. چەقالەبادام؛ فەریکەبادام ☰ ١. نوعی بادام ریـز ٢. چغاله

**حاجی‌بایڤ** / ĥacîbayiv/: ☜ **حاجی‌بایف**

**حاجی‌بایەف** / ĥacîbayef/: ☜ **حاجی‌بایف**

**حاجی‌بەیان** / ĥacîbeyan/: ناو. بابوونـە؛ حاجیلـە؛ گوڵێکی سپی ناو زەردە ☰ بابونه

**حاجی‌حاجک** / ĥacîĥcik/: ☜ **پەڕەسێلکە**

**حاجی‌خـانم** / ĥacîxanim/: نـاو. حـاجی‌ژن: ١. نازنـاوی ژنی حـەجڕۆیشـتوو ٢. نازنـاوی ژنی بەتەمەن ☰ ١و٢. حاج‌خانم

**حاجی‌ڕەش / ĥacîřeş**/: ☜ **پەڕەسێلکە**

**حاجی‌ڕەشک / ĥacîřeşk**/: ☜ **پەڕەسێلکە**

**حاجی‌ڕەنگ / ĥacîřeng**/: ☜ **پەڕەسێلکە**

**حاجی‌ژن / ĥacîjin**/: ناو. ١. ☜ **حاجی‌خانم** ٢. ژنی حاجی ◘ ١. ☜ **حاجی‌خانم** ٢. زن حاجی

**حاجی‌لۆکە / ĥacîloke**/: ناو. گیایەکە بە گوڵی زەردەوە، پیر دەبێ لە نێو گوڵەکەیەوە شتێکی وەک لۆکە دەر دەکا ◘ گیاهی است

**حاجیلە / ĥacîle**/: ناو. ١. بابوونە؛ بابونە؛ گوڵێکی سپی ناو زەردە ٢. گیایەکە بەرێکی تاڵی هەیە و لە ناو دەغڵدا دەڕوێ ٣. حاجی‌لەق‌لەق ◘ ١. بابونە ٢. گیاهی است ٣. لک‌لک

**حاجی‌لەق‌لەق / ĥacîleqleq**/: ناو. حاجی‌لەگ‌لەگ؛ ئەلەرگ؛ ئلرگ؛ هاجی‌لەک‌لەک؛ حاجی‌لەی‌لەک؛ حاجیلە؛ لەق‌لەق؛ لەگ‌لەگ؛ تۆرەمە باڵدارێکی لاق و دەندووک‌درێژی بەلەکن، زۆر هەنگاو دەنێن، لە سەر دار، ڕەوەز یا هەر شوێنێکی بەرز هێلانە ساز دەکەن. بە ماسی، مار، بۆق و کەلاکی گیانلەبەران دەژین، کۆچەرن و گەرمێن و کوێستان دەکەن، دوو جۆری سپی و ڕەشیان هەیە کە ڕەشەکانیان بە حللێر دەناسرێن ◘ لک‌لک

**حاجی‌لەگ‌لەگ / ĥacîlegleg**/: ☜ **حاجی‌لەق‌لەق**

**حاجی‌هەرزانی / ĥacîherzanî**/: ناو. کاسبی هەرزانجان ◘ حاجی‌ارزونی

**حاچە / ĥaçe**/: ناو. ١. ئەمسەر ئەوسەری جێ چادر ٢. لکەدار ٣. پەل؛ فلیقانە ◘ ١. طرفین چادر ٢. شاخەی درخت ٣. شاخە؛ انشعاب

**حا ـ حا / ĥa ĥa**/: دەنگ. ١. وشەی سەیر مان و باوەڕ نەکردن ‹حا ـ حا لەو درۆە گەورە!› ٢. وشەی دەنگ دانی گا لە جووتدا ◘ ١. کلمەی تعجب و ناباوری ٢. کلمەی راندن گاو هنگام شخم

**حادری / ĥad(i)rî**/: ئاوەڵکار. هەرلەجێ؛ جێ‌بەجێ؛ دەم و دەس ◘ فوراً

**حار / ĥar**/: ناو. حاڵ؛ حاڵ‌وباڵ ◘ حال و احوال

**حازر / ĥazir**/: ئاوەڵناو. ١. بەرهەڤ؛ تەیار؛ ئامادە ٢. دیار و خویا ◘ ١. آمادە ٢. آشکار

◘ **حازر بوون**: ١. ئامادە بوون ‹لە دنیادا نەماوە نۆشی بێ نێش/ کەسێک خۆشیی دەوێ، حازر بێ بۆ ئێش «هێمن»› ٢. هێبەر بوون؛ بوون لە جێگایەکدا ‹زاهیرەن فەرمووتە وەختی مردنت حازر دەبم/ وا لە خۆشی مردنم دەمرم، دەسا ئینسافە بەس «حەریق»›. هەروەها: **حازر کردن** ◘ ١. آمادە بودن ٢. حضور یافتن

**حازربەدەست / ĥazirbedest**/: ئاوەڵناو. ئامادە و لە بەردەست ◘ در دسترس

**حازرجواو / ĥazirc(i)waw**/: ئاوەڵناو. چەفتی؛ بۆ قسە دانەماو ◘ حاضرجواب

**حازر ـ حازر / ĥazir ĥazir**/: ناو. گەمەیێکی هەر وەک هەلووکان کە بە گوتنی وشەی «حازر» بە هاوارییان دەسپێدەکا ◘ نوعی بازی شبیە الک‌دولک

**حازرخۆر / ĥazirxor**/: ئاوەڵناو. لەش‌گرانی چاوەڕێی دەستی ئەم و ئەو. هەروەها: **حازرخۆری** ◘ تنبلِ چشم بە دست دیگران

◘ **حازرخۆری بەر سێبەر**: ١. ئێستاکە ‹باسی حالی حازری کوردستان› ٢. لە ئێستادا ‹حالی حازری هیچ پووڵ و پارەیەکم نییە› ◘ ١. کنونی ٢. در حال حاضر

**حازروبازر / ĥazir û bazir**/: ئاوەڵناو. حازرووازر؛ حازروبزر: ١. گەوا و شاهید لە شوێنی ڕووداو ‹خۆی لێرە حازروبازر ئاگای لە هەموو شتێکە› ٢. تەیار و ئامادە ◘ ١. حاضر و ناظر ٢. آمادە و مُهیّا

**حازروبزر / ĥazir û b(i)zir**/: ☜ **حازروبازر**

**حازرووازر / ĥazir û wazir**/: ☜ **حازروبازر**

**حازری / ĥaz(i)rî**/: ناو. خۆراکی سادە و ئامادە؛

خواردنێک کە پێویستی بە لێنان (کولاندن یان برژاندن) نەبێ ‹ورە بچینە مالی ئێمە، حازری هەرچێکمان بوو، دەیخۆین› ☰ حاضری

**حاست** / ĥast/: ☜ **ئاست**[1]

**حاستەم** / ĥastem/: ئاوەلناو. عاستەم: ۱. سەبرۆکە؛ لەسەرخۆ ۲. سەخت؛ دژوار ۳. کەم ☰ ۱. آرام ۲. دشوار ۳. اندک

**حاستەمودووبەلا** / ĥastem û dûbeła/: ئاوەلکار. عاستەمودووبەلانە؛ کەمێک ☰ اندکی

**حاسل** / ĥasił/: ناو. ۱. بەهرە ‹کلێلەی خەفەت نە سەرکاوەی دل/ مەزرەعەی شادیم کەردەن بێ حاسل «مەولەوی»› ۲. خولاسە و پوختە ‹حاسلی کەلام: ڕاست بە و ڕاست برۆ! «پەند»› ☰ ۱و۲. حاصل

**حاسمان** / ĥasman/: ☜ **ئاسمان**

**حاسێ** / ĥasê/: ئاوەلناو. ۱. وەڕەز ۲. سەخت؛ حاستەم (بۆ چیا و دۆل) ☰ ۱. عاصی ۲. دشوارگذر

**حاش** / ĥaş/: ئاوەلناو. ۱. بێبەهرە ۲. بێنرخ ☰ ۱. بیهوده ۲. بی‌ارزش

**حاشا**[1] / ĥaşa/: ناو. هاشا؛ هەشا؛ ئینکار؛ ماندەل ‹بە سەگم گوت: عەجەبا قەومتە حوسنی پاشا/ تووڕە بوو کلکی لەقان و وتی: حاشا! حاشا! «شێخ ڕەزا»› ☰ انکار

◘ **حاشا کردن**: ۱. خوەنین؛ ئینکار کردن؛ نەدرکاندنی ڕاستی ‹شیوەنی من شینی کوردی بێبەشە/ ئەو گەلەی حاشا دەکەن لێی و هەشە «هێمن»› ۲. دەست لە شوو بەردانی ژن ☰ ۱. انکار کردن ۲. رها کردن شوهر

**حاشا**[2]: ئاوەلکار. هاشا؛ هەشا؛ هەرگیز؛ نا ‹ئەی جیلوەدەری حوسن و جلەوکێشی تەماشا!/ سەرڕشتەیی دین بێ مەدەدی تۆ نییە حاشا «نالی»› ☰ هرگز

**حاشا**[3]: دەنگ. هەرگیز؛ قەت؛ وشەی دووری و بێزاری ‹حاشا لەو خوێنە شەوی بە سەرا هات! «پەند»› ☰ حاشا

**حاشاحازری** / ĥaşahaz(i)rî/: سارستە. دوور بێ لە ڕووی حازران ‹حاشاحازری ئێـژی کەرە و ئەلەوەڕێ!› ☰ دور از روی حضار

**حاشار**[1] / ĥaşar/: ☜ **ئاشار**

**حاشار**[2]: ئاوەلناو. شاروە؛ شاردراوە ‹ستێرەی گرشەداری ئاسمانی میللەتی کوردی/ لە نێو کفنی سپی حاشارە وەک فانۆس و هەرڕەنگە «حقیقی»› ☰ پنهان

**حاشاکەر** / ĥaşaker/: ئاوەلناو. کەتمانکەر ☰ انکارکننده

**حاشاوەلیللا** / ĥaşawelîlla/: سارستە. هەرگیزای هەرگیز؛ بە هیچ بارێکدا نە ☰ حاشا و کلا؛ بە هیچ وجه

**حاشاهەلنەگر** / ĥaşahełnegir/: ئاوەلناو. تایبەتمەندی بابەتێکی تەواو ڕوون کە نەکرێ خۆی لێ لادەی ‹ڕاستییەکی حاشاهەلنەگرە!› ☰ غیرقابل‌انکار

**حاشتەبا** / ĥaşteba/: ☜ **ئاشتەبا**

**حاشیە** / ĥaş(i)ye/: ناو. ۱. کەنارە؛ زێوار؛ لێچ؛ قەراخ ۲. پیارزک؛ پەراوێزی کتێب ☰ ۱. کنارە؛ کرانە ۲. حاشیەی کتاب

**حافز** / ĥafiz/: ناو. ۱. کوێری قورعان لە سنگ ۲. [کینایە] کوێر لە چاوان ☰ ۱. نابینای حافظ قرآن ۲. نابینا

**حافزە** / ĥaf(i)ze/: ناو. بیر؛ یادگە؛ بیرەوەری ☰ حافظە

**حاقۆ** / ĥaqo/: ناو. جۆرێ کۆتر ☰ نوعی کبوتر

**حاکم** / ĥakim/: ناو. ۱. کەسێ کە بە سکالای خەلک ڕادەگا ‹ئەترسم بمرم نەگەم بە مرادم/ یار بێ بە حاکم نەپرسێ دادم «فولکلۆر»› ۲. دەسەلاتداری ولات ‹لەو سالەوە کە حاکمی بابان بەدەرکران/ نەیدیوە کەس لە چهرەیی کەس

جەوهەری هونەر «سـالم»> ۳. دەوریَ لـە کایـەی وەرەقدا کە پەڕی حوکم دیاری دەکا 🇮🇷 ۱. قاضی ۲. فرمانروا؛ حاکم ۳. نقشی در بازی ورق

▣ **حاکمی شەرع:** ئەوی لە سەر شـەریعەت حـوکم دەکا 🇮🇷 حاکم شرع

**حالۆری / ĥalorî/:** نـاو. ۱. بەران و نێری لـە کـاتی وەبەران و وەتەگـە هـاتنی مـەڕ و بـزن، کـە لـە مێگەلێکەوە دەیبەنە نێو مێگەلێکی‌تـر ۲. /کنایە/ پیاوی چاوچلێس و تۆلاز 🇮🇷 ۱. قوچی کـە هنگـام جفت‌گیری از گلەای به گلەی دیگر می‌برند ۲. هیـز و لاابالی

**حالوت / ĥalût/:** ☜ **هەڵوژە**

**حالـەت / ĥalet/:** نـاو. حـاڵ؛ حالـەت؛ دۆخ 🇮🇷 موقعیت

**حاڵ / ĥał/:** ناو. ۱. چۆنیەتی؛ چلۆنایەتی؛ چۆنیەتی شتێ یان بـارودۆخی کەسـێ (لـە خراپـی، باشـی، گەرمی، ساردی، خۆشی، ناخۆشـی) ‹گـوتم ئایـا بـە زاری خۆت ئەپرسی حالی زاری من؟/ بـرۆی هێنایـە یەک وەک شکلی لا، یەعنی کە بێزارم! «نالی»› ۲. جەزمەی دەروێشان ‹حالە بەدحالـی لـە شـوێن و ماڵە وێرانی لە دوو/ مەحویا! گەر ئەهلی حالی، حاڵ و مالم بۆ چییە! «مـەحوی»› ۳. کەیف و خۆشـی 🇮🇷 ۱. حال و احوال ۲. جذبه ۳. حال؛ لذّت

▣ **حاڵی حازر:** ۱. ئێستاکە ‹باسی حالـی حـازری کوردستان› ۲. لە ئێستادا ‹حالـی حـازری هـیچ پووڵ و پارەیەکم نییـە› 🇮🇷 ۱. کنـونی ۲. در حـال حاضر

▣ **حاڵ بون:** خاوەن خۆشـییەکی تایبـەت بـوون ‹حەجەر هەر وەک شەجەر ناتیق بە سیرڕی قودرەتی حەق بوو/ کەسێ حالی بێ حالی دەبێ گەر ئەهلی بینا بێ «حەریق»› 🇮🇷 حال داشتن

**حاڵ تیا نەبون:** بێ‌حاڵ بوون 🇮🇷 حال نداشتن

**حاڵ تێکچون:** ۱. دڵ هەڵشێوان ۲. تووشی قێن و بێزاری بوون 🇮🇷 ۱. حال به هم خوردن ۲. متنفر شدن

**حاڵ شڕ بـون:** ۱. زۆر ناخۆش بوون؛ تووشـیاری نەخۆشینی سەخت بوون ۲. لـە بـارودۆخێکی زۆر خراپدا بـوون ‹هـەموو کـەس حالـی شـڕە/ دوژمن نان و دۆبرە «هـێمن»› 🇮🇷 ۱. بدحال بـودن ۲. بد احوال بودن

**حاڵ لێهاتن:** تووشی حالەتی تایبـەتی هـاتن و جەزبە گرتن 🇮🇷 حالت جذبه دست دادن

**(لـە) حـاڵی کەسێک پرسین:** هەواڵـی کەسـێ پرسین ‹کەس ناپرسێ لـە حالـم/ لـە مـاڵ و لـە منالم «بەیت»› 🇮🇷 احوال کسی را پرسیدن

**حاڵی کەسێک هاتنەوە سەر خۆ:** هاتنەوە سەر خۆ؛ گەڕانەوە بۆ دۆخی سروشتی خۆ 🇮🇷 حال کسـی جا آمدن

**هاتنەوە سەر حاڵ:** بووژانەوە 🇮🇷 سر حال آمدن

**حاڵات / ĥałat/:** نـاو. جەزمەی دەروێش لـە کـاتی زیکرا 🇮🇷 حالت جذبه

**حاڵپەرێشان / ĥałperêşan/:** ئاوەڵـناو. پرۆپەشـێو؛ کەساس 🇮🇷 پریشان‌حال

**حاڵخراب / ĥałx(i)rab/:** ئاوەڵناو. کەلەلا؛ شەق‌وشڕ 🇮🇷 بدحال

**حاڵزان / ĥałzan/:** ئاوەڵـناو. زانـا؛ ژیـر و خـاوەن لێکدانەوە ‹وە غەلـەت مەشـهوور حـاڵ‌زان دەردان/ پەی وێـت وەرپـا کـەرد هەناسـەی سـەردان «مـەلا ڕەحیم بولبول»› 🇮🇷 حاذق؛ دارای تشخیص

**حاڵشڕ / ĥałşiř/:** ئاوەڵـناو. کەلـەلا؛ شـەق‌وشـڕ 🇮🇷 بدحال

**حاڵنەدار / ĥałnedar/:** ئاوەڵناو. بەدحاڵ 🇮🇷 بدحال

**حاڵوئەحواڵ / ĥał û 'eĥwał/:** نـاو. گـوزەران و بـارودۆخی کـەس/ شـتێ ‹مـام وسـوو گیـان! ... حاڵونەحواڵ؟/ شوکر باشـی؟ «شـێرکۆ»› 🇮🇷 حـال و احوال

**حاڵوباڵ** / ĥał û bał/: ناو. حاڵوحیکایەت: ۱. نەقڵ؛ بەسەرهات ۲. وەزع؛ بارودۆخ ☰ ۱. سرگذشت ۲. وضعیت

**حاڵوحەوسەڵە** / ĥał û ĥewsełe/: ناو. دەس و دڵ؛ لەش؛ گورد و هۆگر، بەتایبەت بۆ ئەنجامدانی کاریَ ‹ئێوەش حاڵوحەوسەڵەی نوێژ خوێندتان نییە؟› ☰ حالوحوصله

**حاڵوحیکایەت** / ĥał û ĥîkayet/: ☜ **حاڵوباڵ**

**حاڵەت** / ĥałet/: ناو. حالەت؛ دۆخ ☰ موقعیت

**حاڵی** / ĥałî/: ئاوەڵناو. تێگەیشتوو ☰ فهمیده

◘ **حاڵی بوون:** تێگەیشتن ‹حەجەر هەر وەک شەجەر ناتیق بە سیڕڕی قودرەتی حەق بوو/ کەسێ حاڵی ببێ حاڵی دەبێ گەر ئەهلی بینا بێ «حەریق»› ☰ فهمیدن

**حاڵی کردن:** تێگەیاندن ☰ فهماندن

**حاڵیبووگ** / ĥałîbûg/: ئاوەڵناو. تێگەیشتوو ☰ فهمیده

**حاملان**[1] / ĥam(i)lan/: چاوگ. ڕەنێو هێنران؛ پەروەردە کران ☰ پرورش یافتن

**حاملان**[2]: ناو. پەروەردە ☰ پرورش

**حاملاندن** / ĥam(i)landin/: چاوگ. ڕەنێو هێنان؛ پەروەردە کردن ☰ پروردن؛ بار آوردن

**حان**[1] / ĥan/: ناو. ۱. عان؛ دەم؛ وەخت؛ کات؛ چاخ ‹لەو حانە حاجی هاتنەوە› ۲. حەن؛ جێگە ‹لەم حانە ڕاوەستاوم› ☰ ۱. هنگام ۲. جا؛ مکان

**حان**[2]: ئاوەڵناو. بەئەزموون و زانا ☰ عالم؛ دانا

**حاند** / ĥand/: ناو. حان؛ حەن؛ حەنا؛ جێگەیەکی دیار ‹تە مالەکە لەم حاندە بوو› ☰ جای معیّن

◘ **لە حاند:** ☜ **لە حاندی**

**لە حاندی:** لە حاند؛ لە بەرامبەری؛ لە هەمبەری ‹پێم وا بوو کە تۆ بەخێو دەکەم من/ پاسم دەگری لە حاندی دوژمن «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ در برابر

**حانەحەپەشێ** / ĥaneĥepeşê/: ناو. *[پلار]* دەمەقرە؛ شەڕەچەقە؛ کاری دەم لە دەمی یەکتر نان ☰ درگیری لفظی

**حاواندنەوە** / ĥawand(i)newe/: چاوگ. تێپەڕ. //حاواندتەوە؛ دەحاوێنیەوە؛ بحاوێنەوە// حەواندنەوە؛ حەوانەوە: ۱. سەرپەرشتی کردن ‹سێ ساڵە ئەو منداڵە بێسەرپەرستانە دەحاوێنێتەوە› ۲. پەنا دان ‹کوردستان دوو لە سێی پەنابەری شەڕی ناوچەکە دەحاوێنێتەوە› ۳. هێور کردنەوە؛ ئارام کردنەوە ‹ئەو منداڵە بحاوێنەوە!› ☰ ۱. حمایت کردن ۲. پناه دادن ۳. آرام کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: —/ چاوگی نەرێنی: نەحاواندنەوە

**حاوانەوە** / ĥawanewe/: چاوگ. تێنەپەڕ. //حاوایەوە؛ دەحاوێیەوە؛ بحاوێوە// حەوان؛ حەویان؛ حەوینەوە؛ حاویانەوە؛ ژیان بە سەر بردن بە ئاسوودەیی ☰ آسودن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: حاواوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەحاوانەوە

**حاوقان** / ĥawqan/: چاوگ. قەتیس مان ☰ گرفتار شدن

**حاویانەوە** / ĥawyanewe/: ☜ **حاوانەوە**

**. حاوێن** / -ĥawên/: ☜ **ـ حەوێن**

**حاوێنەر** / ĥawêner/: ئاوەڵناو. پەنادەر و هەدادەر ☰ حامی

**حای** / ĥay/: دەنگ. حای ـ حای؛ وشەی سەیر مان ‹حای لەو خۆشییە!› ☰ وا؛ وه؛ کلمەی تعجب

**حای . حای** / ĥay ĥay/: ☜ **حای**

**حایشان** / ĥayşan/: چاوگ. وا حەساو کردن؛ وا بۆ چوون ☰ انگاشتن

**حدود** / ĥ(i)dûd/: ☜ **حەد ـ۳**

**حرچ** / ĥirç/: ناو. ورچ؛ حش ☰ خرس

**حرماندن** / ĥirmandin/: چاوگ. لووشەلووش

کردن ☰ لندیدن چارپا

**حرِـحرِ** / ĥiř ĥiř/: دەنگەناو. حیلـەی ئەسـپ ☰ شیهەی اسب

**حس** / ĥis/: ☜ **حەس**[1]

**حسری** / ĥisrî/: ئاوەڵناو. تینوو ☰ تشنه

**حسکە** / ĥiske/: نـاو. حوسـکە؛ جـۆرێ تفـەنگی قەدیمی ☰ نوعی تفنگ قدیمی

**حش** / ĥiş/: ☜ **ورچ**

**حشک** / ĥişk/: ئاوەڵناو. وشک؛ زوها ☰ خشک

**حشکارە** / ĥişkare/: ناو. ١. وشکارۆ؛ چۆڵ و بیابانی بێئـاو ٢. داری گەنـدەڵ و ڕزیـو ☰ ١. بیابـان ٢. درخت فرسوده

**حشکاوس** / ĥişkawis/: ☜ **خەفتان**[٢]**ـ١**

**حشکە** / ĥişke/: ناو. وشکە؛ نەخۆشـی ڕەق بـوونی مل و بنانگوێ ☰ بیماری انقباض عضلات گردن

**حشکەبەر** / ĥişkeber/: ناو. وشکەچن؛ وشـکەبەرد؛ دیواری لە بەردی بێقـوڕ ☰ دیـوار سـنگی بـدون ملات

**حشکەدرۆ** / ĥişked(i)ro/: ناو. درۆی زۆر ئاشکرا ☰ دروغ واضح

**حشکەکەل** / ĥişkekel/: ناو. کاری جلک لە ناو ئاودا کولاندن، بێ سابوون ☰ عمل جوشـاندن لبـاس در آب بدون صابون

**حشـکەمرۆ** / ĥişkem(i)ro/: ئاوەڵـناو. *[پـلار]* ڕژد؛ چکووس؛ دەس‌قووچاو ☰ خسیس

**حشکەمز** / ĥişkemiz/: ☜ **وشکەمز**

**حشـکەنمێژ** / ĥişken(i)mêj/: ئاوەڵـــناو. *[پـــلار]* کەم‌نوێژ؛ نوێژکەهاڵ ☰ سهل‌انگار در نماز خواندن

**حکومەت** / ĥ(i)kûmet/: ناو. حوکمەت؛ حوکمات: ١. دەسـچوویی ‹لـە مـالا حکوومـەت ئـەکا!› ٢. دەزگایـەکی دەوڵـەتی کـە بـە سـەر ولات یـا ناوچەیەکدا فەرمان دەدا ‹حکوومەتـی ئـەردەڵان› ٣. ڕژیمی سیاسـی ‹حکوومەتـی کۆمـاری› ☰ ١. نفوذ ٢. حکومت ٣. رژیم سیاسی

**حل** / ĥil/: ☜ **حێل ـ٢**

**حللوربللور** / ĥillurbillur/: ☜ **حولوربلور**

**حللووربللوور** / ĥillûrbillûr/: ☜ **حولوربلور**

**حللێر** / ĥillêr/: نـاو. لەگـلەگی ڕەش؛ باڵـندەیەکە لە تۆرەمەی لەگـلەگ، پەڕ و باڵی ڕەش، بەرزگی سپی و دندووک و لاق و دەوری چاوی سوورە، لە گـۆل و چـەم و زەلکـاو و دارسـتاندا دەبینـرێ، هاوینان زۆرە ☰ لک‌لک سیاه

**حلوربلور** / ĥ(i)lûrb(i)lûr/: ☜ **حولوربلور**

**حلەزرە** / ĥ(i)lez(i)re/: نـاو. ترێ‌مارانە؛ ڕەزڕەزۆک ☰ تاجریزی

**حلێب** / ĥ(i)lêb/: ئاوەڵـناو. حلێـو؛ هلێـو؛ شـیاو؛ درووس؛ ڕەوا ☰ جایز

**حلێرک** / ĥ(i)lêrik/: ناو. لوو؛ لک؛ تریفـە؛ گـرێ و لکی گۆشت ☰ غدّەی گوشت

**حلێو** / ĥ(i)lêw/: ☜ **حلێب**

**حمام** / ĥ(i)mam/: ☜ **حومام**

**حمێز** / ĥ(i)mêz/: ناو. ئامێز؛ باوەش ☰ آغوش

**حندحۆ** / ĥindĥo/: ☜ **حندرحۆ**

**حنـدرحۆ** / ĥindirĥo/: نـاو. حەنـدرحۆ؛ حنـدحۆ؛ حینـدرحۆ؛ هەلـەق‌مەلـەق؛ سیسـۆ؛ جێجڵـقانە؛ هیلاهۆپ ☰ الاکُلنگ

**حندۆلی** / ĥindolî/: ☜ **دۆدانە**

**حنگـل** / ĥingil/: نـاو. ١. ☜ **هـەنگـڵ ـ١** ٢. گەمەیەکە دارێکی تیژکراو لە زەوی ڕادەکـەن ☰ ١. ☜ **هەنگڵ ـ١** ٢. از بازیهای محلی

**حـوب** / ĥub/: نـاو. ١. حـەب؛ هـەب؛ گزموولـەی دەرمـان ‹حوبەکـەت خـوارد؟› ٢. خۆشەویسـتی ‹حوبت لە دڵمە› ☰ ١. قرص ٢. محبت

**حـوبێ** / ĥubê/: نــاو. قومقومــــە؛ خەمــــەگرۆ؛ سەرمازەڵە؛ بزن‌مژە ☰ بُزمجە؛ آفتاب‌پرست

**حوت** / ĥut/: ئاوەڵناو. پان و قەڵەو ☰ لندهور

**حوترەك / ĥutrek/:** ناو. کوتک 🇮🇷 پُتک

**حوججەت / ĥuccet/:** ناو. تەوژم؛ نهێم 🇮🇷 فشار

**حوجرە / ĥucre/:** ناو. هجرە؛ هوجرە: ۱. ژووور لە مزگەوت بۆ فەقێ ‹لەم حوجرە، لە بەر پەنجەرە کەوتووم و دەخوێنم/ بێعەینی دەڵێی بولبولی گۆشەی قەفەسێکم «نالی»› ۲. هۆدە؛ وەتاغ؛ ژووری ماڵ ‹قافلە کۆچ کەردەن بەرزەن دەنگ زەگ/ وران حوجرەی خان وجود سەنگ بە سەنگ «مەولەوی»›۳ . نووسینگەی بازرگان لە بازاڕدا 🇮🇷 ۱. حجرەی مسجد ۲. حجرەی بازار

**حوجەتولئیسلام / ĥucetul'îslam/:** ناو. /شیعە/ سەرناوی مەلایانی شیعە، خوارتر لە ئایەتوڵلا 🇮🇷 حجت‌الاسلام

**حوحانە / ĥuĥane/:** ناو. هەڵپەڕکێی کچۆلانە 🇮🇷 رقص دخترانە

**حود / ĥud/:** ناو. دەفری لچ و لێو شکاوی لە سواڵەت 🇮🇷 ظرف گلی لب‌پرشده

**حورچ / ĥurç/:** ☜ ورچ

**حورگ / ĥurg/:** ☜ ورگ

**حورگش / ĥurgiş/:** ناو. ناوزگ؛ ورگ و ناو؛ هەناو 🇮🇷 احشا

**حورمەت / ĥurmet/:** ناو. هورمەت؛ ڕێز و قەدر 🇮🇷 احترام

▣ **حورمەت گرتن:** ڕێز گرتن ‹دەبێ حورمەت بگیرێ، جێ نەزەرگەی حەزرەتی یارە/ کە ناکا دەمبەدەم تۆفانی دەم زیر و زەبەر چاوم «مەحوی»› 🇮🇷 احترام گذاشتن

**حورمەتدار / ĥurmetdar/:** ناوەڵناو. بەڕێز؛ خاوەن حورمەت 🇮🇷 محترم

**حورمەتگیر / ĥurmetgîr/:** ناوەڵناو. ڕێزگر؛ قەدرگیر ‹چووین بۆ ماڵیان زۆر حورمەتگیر بوون› 🇮🇷 احترام‌گذار

**حورمێ / ĥurmê/:** دەنگ. هورمێ؛ وشەی بانگ کردنی ژن لە لایەن مێردییەوە ‹یووسف! واز لەم باسە بێنە. حورمێ! تۆش بووردن لە خەتات داوا بکە؛ کە تۆ لە خەتاکارانی «هەژار، *قورئان*»› 🇮🇷 واژەی خطاب شوهر به همسرش

**حوزم / ĥuzm/:** ناو. شەرم و حەیا و سەنگینی 🇮🇷 وقار

**حوزوور / ĥuzûr/:** ناو. هەنتەش؛ هەندەر 🇮🇷 حضور

**حوزەیران / ĥuzeyran/:** ناو. حەزیران؛ حوزەیران؛ هزێران؛ هەزیران؛ جوون؛ شەشەمین مانگی ڕۆمی، لە ۱۰ی جۆزەردانەوە تا ۱۰ی پووشپەڕ 🇮🇷 حُزیران؛ ژوئن

**حوژم / ĥujm/:** ناو. جۆلانێ 🇮🇷 تاب بازی

**حوژە / ĥuje/:** ناو. ئەسپۆن؛ سپۆن 🇮🇷 چوبک

**حوسکە / ĥuske/:** ☜ حسکە

**حوشتر / ĥuştir/:** ناو. حێشتر؛ وشتر 🇮🇷 شتر

**حوشترئالوک / ĥuştir'alûk/:** ☜ وشترخۆرە

**حوشترالۆک / ĥuşt(i)ralok/:** ☜ وشترخۆرە

**حوشترخان / ĥuştirxan/:** ☜ وشترخان

**حوشترخوا / ĥuştirx(i)wa/:** ناو. بالووک؛ تاژیلە؛ تاجی‌مامئەحمەدە؛ ئەسپی‌حەسەن‌حوسێنان 🇮🇷 آخوندک

**حوشترخوار / ĥuştirx(i)war/:** ☜ وشترخۆرە

**حوشترخۆرکە / ĥuştirxorke/:** ☜ وشترخۆرە

**حوشتردانە / ĥuştirdane/:** ☜ وشتردانە

**حوشترسوار / ĥuştirs(i)war/:** ☜ هێشترسوار

**حوشترگەروو / ĥuştirgerû/:** ☜ وشترگەڵوو

**حوشترگەڵوو / ĥuştirgelû/:** ☜ وشترگەڵوو

**حوشترمرخ / ĥuştirmirx/:** ☜ وشترمر

**حوشترمەل / ĥuştirmel/:** ☜ وشترمر

**حوشتروان / ĥuşt(i)rewan/:** ☜ وشتروان

**حوقنە / ĥuqne/:** ناو. ئیمالە؛ کاری ڕۆ کردنی ئاو و شلەی دەرمانی لە کۆمەوە بۆ ناو ڕیخۆڵە گەورە، تا باو گرفتەکانی بڕەوێنێ 🇮🇷 حُقنه؛ اِماله

**حوکم / ĥukm/:** ناو. هکم: ١. فەرمان؛ ئەمر؛ دەستوور؛ قسە یان نووسراوەیەک کە بە پێی ئەوە کارێک لە ژێردەست یان تاقمێک داوا کراوە ‹خزمەتی خاکی وەتەن، فەرزێکی عەینە بۆ هەمووا/ داخلی ئەم حوکمەیە، کێ فەرقی جوان و پیر ئەکا؟ «شێخ بابارەسوول»› ٢. فەرمانی فەرمانڕەوا ‹نەفس ئەممارە حوکم میری بەرد/ شەیتانیچ فەرمان وەزیری ئاوەرد «ئەحمەد کلاشی»› ٣. بڕیاری قازی ‹نە خودا بەردار، نە بەندە ڕازی/ نە فتوای شەرعەن، نە حوکم قازی «سوارە»› ٤. جۆرێ کایە بە وەرەق ☰ ١. فرمان ٢. حکم ٣. رای قاضی ٤. بازی حُکم در ورق بازی

▣ **حوکم کردن:** ١. پێ چەقاندن ‹حوکمی کردووە دەڵێ هەر دەڕۆم› ٢. فەرمان دان ‹میر حوکمی کردووە ئەگەر بۆ ئەمشۆ ئافرەتێکی بۆ پەیدا نەکەم لە دارم دا «سوارە»› ٣. حکوومەت کردن ٤. کایەی حوکم کردن ☰ ١. پافشاری کردن ٢. دستور دادن ٣. حکومت کردن ٤. حکم بازی کردن

**حوکمات / ĥukmat/:** ☜ **حکومەت**

**حوکمەت / ĥukmet/:** ☜ **حکومەت**

**حولچەک / ĥulçek/:** ☜ **هەڵوژە**

**حولحولی / ĥulĥulî/:** ئاوەڵناو. وازوازی؛ هەردەم لە سەر خەیاڵێک ☰ دمدمی

**حولحولیمەزاج / ĥulĥulîmezac/:** ئاوەڵناو. حوولحوولی؛ حولحولیمەزەو؛ حوولحوولیمەزەو؛ عەنتەرمەزاج؛ وازوازی ☰ دمدمی‌مزاج

**حولحولیمەزەو / ĥulĥulîmezew/:** ☜ **حولحولیمەزاج**

**حوللور / ĥullûr/:** ☜ **حولوربلور**

**حوللەسێ / ĥullesê/:** ناو. ١. حوللەمەرەسێ؛ گەمەیەکە بە سێ جگ دەکرێ ٢. *[مەجازی]* ڕەوتی داکەوتن لە پاش سەرکەوتن ☰ ١. نوعی قاپبازی ٢. شکست بعد از پیروزی

**حوللەمەرەسێ / ĥullemeresê/:** ☜ **حوللەسێ-١**

**حولوربا / ĥulûrba/:** ناو. کونەبا؛ هەواکێش ‹حولووربایە/ ڕووی لە خوایە «مەتەڵ»› ☰ هواکش

**حولوربلور / ĥulûrb(i)lûr/:** ناو. حوللوور؛ حللوربلوور؛ حللووربللوور؛ حلووربلوور؛ گاڵتەیەکی منالانەیە ☰ از بازی‌ها

**حولوک / ĥulûk/:** ☜ **هەڵوژە**

**حولویسک / ĥulûysik/:** ناو. شیلاوک؛ هەوێنی پەنیر ☰ مایەی پنیر

**حولە / ĥule/:** ناو. پشکەڵی وشتر ☰ سرگین شتر

**حولەسێ / ĥulesê/:** ناو. هەرا؛ هەرا؛ زەنا؛ زەنا؛ چەقە و گوڕە ☰ جار و جنجال

**حولی[1] / ĥulî/:** ناو. هەڵووژەسوورە/ ڕەشە ☰ آلو بُخارا

**حولی[2]:** ئاوەڵناو. ١. لووس؛ خز؛ خز ٢. *[کینایە]* زمانلووس و هەڵخەڵەتێن ☰ ١. لیز ٢. چرب‌زبان

**حولیاتی / ĥulyatî/:** ناو. *[کینایە]* مەرایی؛ ڕووبینی؛ کاری ماستاو کردن ☰ تملق؛ چاپلوسی

**حولیبوگ / ĥulîbûg/:** ئاوەڵناو. ساویاو؛ سفتە ☰ سایدەی صاف شدە

**حولیچەک / ĥulîçek/:** ☜ **هەڵوژە**

**حولیسین / ĥulîsîn/:** چاوگ. هەڵخلیسکان ☰ لغزیدن

**حولیک / ĥulîk/:** ناو. هەڵووژە؛ حولووک؛ حەلووک؛ عەلووک؛ حولووک ☰ آلو

**حومال / ĥumał/:** ناو. داری گەورەی پەڕانپەڕیی بۆ دارەڕا ☰ بالار

**حومام / ĥumam/:** ناو. حەمام؛ حمام؛ گەرماو ☰ حمّام

**حونجە / ĥunce/:** ☜ **حونجی**

**حونجی / ĥuncî/:** ناو. حینجە؛ حونجە؛ هینجە؛ هینجێ؛ کاری گوتنی بڕگەبەبڕگەی وشە ☰ هجّی

**حوونەر / ĥunner/**: ☜ هونەر

**حونەر / ĥuner/**: ☜ هونەر

**حونەرمەند / ĥunermend/**: ☜ هونەرمەند

**حویر / ĥ(i)wîr/**: ☜ عویر

**حویل / ĥ(i)wîl/**: ناو. چێرەیی ☰ صورتی

**حویل[1] / ĥuyl/**: ناو. پەمەیی؛ چێرەیی؛ سووری ئاچخ؛ سۆری کاڵ ☰ صورتی

**حویل[2]**: ئاوەڵناو. پەمەیی؛ چێرەیی؛ بە ڕەنگی سووری ئاچخ ☰ صورتی رنگ

**حۆپ / ĥop/**: دەنگ. وشەی لێخوڕینی وشتر ☰ کلمەی راندن شتر

**حۆپلە / ĥople/**: ☜ حەپۆل

**حۆپن / ĥopin/**: ئاوەڵناو. *[پلار]* زەبەلاحی ناقۆلا ☰ بیقواره

**حۆپە / ĥope/**: ☜ حەپۆل

**حۆت / ĥot/**: ئاوەڵناو. حۆچ؛ تاس؛ هەویز؛ بێقژەسەر ☰ تاس

**حۆچ / ĥoç/**: ☜ حۆت

**حۆری / ĥorî/**: ناو. هۆری؛ هۆریە؛ هووری: ۱. کیژی بەهەشتی ‹حۆرییان جە عەرش مەکەرۆن هانا/ هانا وەی شەوقە نییەن تەوانا «سەید موحەممەد خانەگایی»› ۲. *[مەجازی]* کچی زۆر جوان ‹کیژۆڵەی ڕێکی حۆرین/ بە شەرتێ دڵ نەگۆڕین «ئاوات»› ☰ ۱. حوری ۲. دختر دلرُبا

**حۆریات / ĥoř(i)yat/**: ناو. *[پلار]* کار یان شتی سووک و جلف ☰ کار یا هر چیز مُبتذل

**حۆریاتبازار / ĥoř(i)yatbazař/**: ناو. *[پلار]* ۱. کۆڕی جلفان؛ کەربازاڕ ۲. جلفبازی ☰ ۱. جمع هرزگان ۲. جلفبازی

**حۆق / ĥoq/**: ناو. هۆق؛ هێڵنج ☰ هق

▣ **حۆق کردن**: هۆق کردن؛ هێڵنج دان ☰ بالا آوردن

**حۆقە[1] / ĥoqe/**: ناو. ۱. دەوات؛ دەوێت؛ مەرەکەفدان ۲. کێشێکە بەرانبەر بە سێ یان چوار کیلۆ ☰ ۱. دوات ۲. وزنەای معادل سه یا چهار کیلو

▣ **حۆقەی ئەستەمۆڵ**: کێشێکە بەرانبەر بە حەفتاوپێنج گرەم ☰ وزنەای معادل هفتادوپنج گرم

**حۆقەی تریاک**: ئامرازێکی تریاککێشان ☰ حُقەی تریاک

**حۆقە[2]**: دەنگەناو. دەنگی گامێش ☰ صدای گاومیش

**حۆقەباز / ĥoqebaz/**: ئاوەڵناو. فێڵباز ☰ حقەباز

**حۆل / ĥol/**: ئاوەڵناو. *[پلار]* هۆل: ۱. گێژ؛ گێل ۲. قۆل؛ درێژی پێنەکەوتوو ☰ ۱. خُل ۲. دراز بیقواره

▣ **حۆلی بیابان**: مێردەزمە؛ مێردئەزمە ‹لەم چۆلی پڕ لە حۆلی بیابان و زولمەتە/ وەک خدری زیندە ڕابەری ڕێگەی هودایە غەوس «بێخود»› ☰ غول بیابانی

**حۆلگێل / ĥolgêl/**: ئاوەڵناو. *[پلار]* گێژ و حۆل ☰ گیجومنگ

**حۆلی / ĥolî/**: ناو. ۱. گۆلک؛ گوێرەکە؛ بەچکەچێل ۲. ئۆلی؛ نهۆمی سەرەوەی خانوو ۳. *[پلار]* گێلی ☰ ۱. گوساله ۲. طبقەی آخر ساختمان ۳. گیجی

**حۆیلانێ / ĥoylanê/**: ناو. هەوایەکی گۆرانی جافەتی ☰ از ترانەهای کردی

**حووت / ĥût/**: ناو. ۱. *[ئەستێرەناسی]* وێنەیەکی گەورەی گەردوونییە ۲. *[ساڵنامە]* ڕەشەمە؛ دوایین بورج لە دوازدە بورجی ساڵ ۳. *[پلار]* حەفی؛ حەزیا؛ ئەژدیها ‹خۆم وەکوو زەرنەقوتە و زاڕۆڵەکانم رووتن/ حەوتی وام هەن کە دەمی خواردنێ وەک حەو حووتن! «هەژار، بۆ کوردستان»› ☰ ۱و۲. حوت ۳. اژدها

**حووج[1] / ĥûc/**: ناو. *[باوەڕی کۆن]* عووج؛ پیاوێکی زۆر درێژە لە چیرۆکاندا ☰ مرد بسیار قدبلند افسانەها

**حووج**[۲]: ناوەڵناو. *[کینایە]* قۆل؛ بالابەرزی ناشیرین 🇮🇷 دراز بی‌قواره

**حولحولی** / ĥûlĥûlî/: ☜ **حولحولی‌مەزاج**

**حولحولی‌مەزەو** / ĥûlĥûlîmezew/: ☜ **حولحولی‌مەزاج**

**حە** / ĥe/: ناوەڵناو. حەر؛ حەچ ‹حە جۆر› 🇮🇷 هر

**حەب** / ĥeb/: ناو. حـوب؛ گزمووڵـەی دەرمـان 🇮🇷 قرص (دارو)

**حەبان** / ĥeban/: ناو. جەرە/ گۆزەی ئاو 🇮🇷 کوزەی آب

**حەباندن** / ĥebandin/: ☜ **هەباندن**

**حەبس** / ĥebs/: ☜ **حەپس**

**حەبی** / ĥebî/: ناو. پـەمۆی بـە هـەلاجی کـراو 🇮🇷 پنبەی حلاجی‌شده

**حەبیشاندن** / ĥebîşandin/: ☜ **حەپیشاندن**

**حەپ** / ĥep/: ☜ **حەپە**

**حەپارە** / ĥepare/: ناو. بژار 🇮🇷 وجین

**حەپان** / ĥepan/: چاوگ. حەپـە کـردن 🇮🇷 پـارس کردن

**حەپانـدن** / ĥepandin/: چـاوگ. حەپـە کـردن؛ وەڕینی سەگ 🇮🇷 پارس کردن

**حەپحەپ** / ĥepĥep/: ☜ **عەف‌عەف**

**حەپس** / ĥeps/: ناو. حەبس؛ بەندیخانـە ‹حەپسـی چاهی میحنەتم کافر بە حالی من نەبێ/ کار و پیشەم دائیمەن گریان و شین و زارییە «نالی»› 🇮🇷 حبس

**حەپش** / ĥepş/: ناوەڵناو. گێـل و نـەزان؛ حـۆل 🇮🇷 خُل

**حەپلەحورچ** / ĥepleĥurç/: ناوەڵناو. *[پلار]* گردەڵـە؛ گتە؛ داکوتیاگ؛ کورتەبالای قەڵەو 🇮🇷 چاقالو

**حەپلەری** / ĥeplerî/: ناو. جۆرێ هەنار 🇮🇷 نوعی انار

**حەپنای** / ĥepnay/: چـاوگ. *[پلار]* حەپیشـاندن؛ خەپراندن 🇮🇷 بلعیدن

**حەپۆل** / ĥepol/: ناوەڵناو. *[پلار]* حـاپۆل؛ حەپۆلـە؛ حۆپلـە؛ حۆپـە؛ حەپۆنـە؛ حەپـەنگ؛ تـەژەی ناتێگەیشتوو؛ زەلامی بێکارە و گێژ 🇮🇷 یُغُر

**حەپۆلە** / ĥepole/: ☜ **حەپۆل**

**حەپۆنە** / ĥepone/: ☜ **حەپۆل**

**حەپو** / ĥepû/: ☜ **هەمو**[۲]

**حەپولک** / ĥepûlik/: ناو. حاپوولک؛ نۆرەی کایـە ‹دەست پێبکەوە حەپوولکی تۆیە!› 🇮🇷 نوبت بازی

▣ **حەپولک کێشانەوە**: سـەرلەنوێ هاویشـتنەوەی هەڵمات لە کایەی مێشـێندا ئەگـەر لـە لاقـی کەسێک بدرێت 🇮🇷 اصطلاحی در تیلەبازی

**حەپـە** / ĥepe/: دەنگـەناو. حـەپ؛ حەپەحـەپ؛ وەڕەوەڕ؛ وەڕەی سەگ 🇮🇷 پارس سگ

**حەپـەحۆل** / ĥepeĥol/: ناوەڵـناو. *[پـلار]* گـەمژە؛ حەپۆل 🇮🇷 ابله

**حەپەحەپ** / ĥepeĥep/: ☜ **حەپە**

**حەپەحەپکردو** / ĥepeĥepkirdû/: ناوەڵناو. وەڕیـو 🇮🇷 پارس کرده

**حەپەروت** / ĥeperût/: ☜ **خەوەزینگ**

**حەپەسان** / ĥepesan/: چاوگ. تێنەپەر. //حەپەسـای؛ دەحەپەسێی؛ بحەپەسێ// حەپەسـین؛ عەبەسـان؛ عەبەسران؛ عەپەسان؛ واق وڕمان؛ سەرسام بوون؛ مات بوون؛ لە جێ وشک بوون ‹ئێتـر من ئەوەنـدە تـرسام کە حەپـەسـام و هـەر لـە دوورەوە وێسـتام و نەوێرام خۆمیان نیشان دەم «هەژار، *چـوار نامیلکـە*»› 🇮🇷 سراسیمه شدن

■ ناوەڵناوی بـەرکاری: حەپەسـاو/ چاوگی نـەرێنی: نەحەپەسان

**حەپەسـاندن** / ĥepesandin/: چـاوگ. تێپـەر. //حەپەساندت؛ دەحەپەسێنی؛ بحەپەسێنە// گێـژ و مات کردن؛ هۆش لێ ساندن؛ تووشی سەرسـامی کردن 🇮🇷 سراسیمه کردن

■ ناوەڵـناوی بـەرکاری: ـــ/ چـاوگی نـەرێنی: نەحەپەساندن

**حەپەساو / ĥepesaw/**: ناوەڵناو. حەپەسیو؛ حەپەسای؛ واق‌وڕماو؛ سەرسام ‹هەموو سەرسام و حەپەساو لە دووی مامۆستا دەگەڕان› ☚ سراسیمه

**حەپەسای / ĥepesay/**: ☜ حەپەساو

**حەپەسین / ĥepesîn/**: ☜ حەپەسان

**حەپەسیو / ĥepesîw/**: ☜ حەپەساو

**حەپەسێن / ĥepesên/**: ناوەڵناو. سەیر؛ سەمەرە؛ سەرسووڕێنەر؛ هۆی سەرسام بوون ☚ سرسام‌آور

**حەپەلۆت / ĥepelot/**: ناو. زرمەزلیتانێ؛ چەقە و هەرا و هەڵبەز ـ دابەز ☚ شلوغ‌بازی

**حەپەلووت / ĥepelût/**: ☜ خەوەزینگ

**حەپەمێش‌خۆر / ĥepemêşxor/**: ناوەڵناو. [کینایە، پلار] گێژ و گەوج ☚ گیج و ویج

**حەپەنتی / ĥepentî/**: ناوەڵناو. [پلار] حەپەنۆت؛ زەبەلاح؛ تەژەی پان و پۆڕ؛ زڕ و زەلام ☚ لندهور

**حەپەنگ / ĥepeng/**: ☜ حەپۆل

**حەپەنۆت / ĥepenot/**: ☜ حەپەنتی

**حەپەنۆش / ĥepenoş/**: ناو. کاری بە یەکجاری هەڵلووشین ☚ عمل هورت کشیدن

**حەپەنووس / ĥepenûs/**: ناو. ١. دارێکی ڕەشی بەنرخە ٢. [کینایە] زۆر ڕەش ☚ ١. آبنوس ٢. بسیار سیاه

**حەپی / ĥepî/**: ناو. قۆزاخەی پەمبۆ؛ خۆز لۆکە ☚ غوزەی پنبه

**حەپیشاندن / ĥepîşandin/**: چاوگ. حەبیشاندن؛ هەڵخستن؛ بە پەلە قووت دان ☚ با شتاب بلعیدن

**حەپین / ĥepîn/**: چاوگ. ڕەوین؛ وەڕین؛ حەپاندنی سەگ ☚ پارس کردن سگ

**حەتا / ĥeta/**: ☜ هەتا

**حەتار / ĥetar/**: ناو. ١. وردەواڵەفرۆش ٢. حاتۆر؛ تێلا و کوتکی گێچ کوتان ٣. عەتار؛ دەرمان‌فرۆش ☚ ١. پیلەور ٢. چوب گچکوبی ٣. داروفروش

**حەتتا / ĥetta/**: ئامراز. بەڵکوو؛ تەنانەت ☚ حتی

**حەتحەت / ĥetĥet/**: ☜ حەتحەتۆك

**حەتحەتۆک / ĥetĥetok/**: ناو. حەتحەت؛ گەڵوازە؛ لەیستۆکی هەڵواسراو بە بێشکەوە ☚ اسباب‌بازی آویزان از گهواره

**حەترەک / ĥetrek/**: ناو. کاری لێدان بە توندی ☚ عمل مُحکم زدن

**حەتمەن / ĥetmen/**: ناوەڵکار. بێ‌گومان؛ بێ‌ئەولاولا؛ هەر؛ ئیزدەرم ☚ حتماً

**حەج / ĥec/**: ناو. داب و نەریتی زیارەتی کابە لە باژێری مەککەدا ‹چ میعمارانە بۆ تەعمیری کەعبەی دڵ دەچێتە حەج/ خودا یار و مەدەدکار و نیگەهداری عیماری بێ «نالی»› ☚ حج

▣ **حەجی تەمەتتوع**: حەجی سەرەکی؛ حەج لە دە ڕۆژی سەرەتای زیحەجەدا ☚ حج تمتع

**حەجی عومرە**: حەج نەک لە کاتی خۆیدا ☚ حج عُمره

▣ **حەج کردن**: ١. چوونە حەج؛ چوونە زیارەتی ماڵی خوا ٢. [کینایە] چاکە کردن؛ کاری باش و خێرۆمەندانە کردن ٣. [کینایە] بردنەوەی دوامین کەلا لە گەمەی هەڵماتاندا ☚ ١. حج رفتن ٢. کار ثواب کردن ٣. برنده شدن در تیله‌بازی

**حەجامات / ĥecamat/**: ناو. حەجامەت؛ هەجەمات؛ شوێنگری؛ هەجامات؛ دووژ؛ ڕکەنە؛ تێخ لە پێست دان بۆ خوێن گرتن ☚ حجامت

▣ **حەجامات گرتن**: خوێن گرتن ☚ حجامت کردن

**حەجاماتکێش/ ĥecamatkêş/**: ناو. حەجامەت‌کێش؛ خوێن‌بەردەر؛ وەستای خوێن بەردان ☚ حجامت‌کار

**حەجامەت / ĥecamet/**: ☜ حەجامات

**حەجامەتکێش/ ĥecametkêş/**: ☜ حەجاماتکێش

**حەجمان / ĥecman/**: ☜ حەجمین

**حەجماندن / ĥecmandin/**: چاوگ. ئارام کردن؛

تەبتاندن ☰ آرام کردن

**حەجمەت / ĥecmet/**: ناو. حەژمەت؛ کەسەر؛ مەینەت ‹لە حەجمەتا خەریک بوو شێت بم› ☰ اندوه

**حەجمین[1] / ĥecmîn/**: چاوگ. حەجمان؛ داسەکنین؛ ئارام گرتن ☰ آسودن؛ آرام گرفتن

**حەجمین[2]**: ناو. حەجمان؛ ئۆقرە؛ هەدا؛ ئۆخژن ‹تا هاوین لە لێوژە ماینەوە. هەمووماان تووشی زگ ئێشەی زۆر سەخت بووین. مێشوولە کوێرەش حەشری دەکرد و حەجمینمان نەمابوو «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ آرام و قرار

**حەچ[1] / ĥeç/**: ناو. ١. شەق؛ کاشۆ؛ گۆچانی گەمەی گۆیێن ٢. حەچە؛ نێری؛ نێرەبزنی پێگەیشتوو ☰ ١. چوگان ٢. تکّه

**حەچ[2]**: ئاوەڵناو. حەر؛ هەر ☰ هر

**حەچان[1] / ĥeçan/**: چاوگ. وەڕین؛ ڕەوین؛ حەپین ☰ پارس کردن

**حەچان[2]**: ناو. شەقێن؛ گۆیێن؛ کاشۆبازی؛ گەمەی گۆ و گۆچان ☰ چوگان‌بازی

**حەچاندن / ĥeçandin/**: چاوگ. ١. وە حەپە هێنان؛ حەپە لێ‌کردن؛ دنە دانی سەگ بۆ وەڕین ٢. حەچە کردن؛ کەر لێخوڕین؛ ئاژۆتنی کەر ☰ ١. پارس دادن سگ ٢. راندن خر

**حەچچە / ĥeçce/**: دەنگەناو. هەچە؛ حەچە؛ وشەی لێخوڕینی گوێرێژ ☰ واژەی راندن ستور

**حەچکۆ / ĥeçko/**: ئامراز. هەرچۆنێک؛ هەرجۆر ☰ هرطور

**حەچولور / ĥeç û lûr/**: دەنگ. ١. حەپە و لوورەی تێکەڵ ٢. هەرا و زەنا ☰ ١. عوعو و زوزە کشیدن توأم ٢. دادوقال

**حەچە[1] / ĥeçe/**: ناو. حەچ؛ تەگە؛ سابرین ☰ تکّه

**حەچە[2]**: دەنگ. وشەی لێخوڕینی کەر ☰ صوت برای راندن الاغ

☒ **حەچە لێ کردن**: لێخوڕین؛ ئاژۆتنی وڵاخ ☰ راندن الاغ

**حەچەحەچ / ĥeçeĥeç/**: دەنگەناو. حەپەحەپی زۆر و بێبڕانەوە ☰ پارس مداوم

**حەچەل / ĥeçel/**: ناو. هەچەل؛ تەشقەڵە؛ شلتاغ؛ گەڕ؛ دەبە؛ بروبیانوو ☰ شلتاق

**حەح / ĥeĥ/**: دەنگ. وشەی سەیر مان ‹حەح! چەند سەیرە!› ☰ وا؛ کلمەی تعجب

**حەد / ĥed/**: ناو. حەدد؛ هەد: ١. ڕادە؛ هەند؛ شۆ ‹ماوای دلگەرمیش جە حەد بەر شیەن/ لایق وە مەنزڵ یاد ئەو نیەن «مەولەوی»› ٢. شیاوی ‹من حەدم چێشا، قابلم چکۆن/ عیلم و مەعریفەت هەر لایەق وە تۆن «مەلا حەسن دزلی»› ٣. حدوود؛ سنوور؛ کەوشەن ‹هەر لە مووسڵ هەتا حەدی بابان/ بەیتیان کردووە وەکوو جافان «حاجی قادر»› ٤. */ئیسلام/* سزای گوناهێ کە بە پێی شەرع دیاری کرابێ ☰ ١. اندازه ٢. شایستگی ٣. مرز ۴. حدّ شرعی

☒ **حەد لێدان**: */ئیسلام/* بە جەزیای شەرع گەیاندنی گوناهکار ☰ حد زدن

**حەدد / ĥedd/**: ☜ **حەد**

**حەدوسەد / ĥed û sed/**: ناو. جەنگە؛ هەڕەت؛ تاف ☰ موسم

**حەدەف / ĥedef/**: ناو. تەپۆلکە؛ گرد؛ گردولکە ☰ تپەی کوچک

**حەدیس / ĥedîs/**: ناو. */ئیسلام/* قسە، گوتار یان ڕێوڕەوشتی پێغەمبەری ئیسلام ☰ حدیث

**حەر / ĥer/**: ئاوەڵکار. هەر: ١. هەرگیز؛ قەت ‹حەر شتی وام نەدیوە› ٢. هەرکە؛ کاتێ ‹حەر من هاتم ئەو هەڵسا› ٣. هەمیشە؛ دایمە ‹حەر بۆ ماڵی خەزووری پەل دەکشێ› ☰ ١. اصلاً ٢. وقتی؛ همین کە ٣. همیشه

**حەراج / ĥerac/**: ☜ **هەڕاج**

**حەرام / ĥeram/**: ئاوەڵناو. حەڕام: ١. */ئیسلام/* ناڕەوا؛

کارێ کـە شـەرع قەدەغـەی کـردووە. بەرانبـەر: حـەلاڵ ۲. بەربەسـت؛ بـەرپێ‌گـیراو ۳. خەسـار؛ خراپ؛ زایە ☰ ۱و۲. حرام ۳. هدر

◘ **حەرام کردن:** ۱. قەدەغە کردن بەپێی فـەرمانی ئایینێک ‹خواردنەوەی مەی بۆ موسوڵمان حـەرام کراوە› ۲. بەربەست کردن؛ بەرپێ گـرتن ۳. لـە حـەرام گێـڕان؛ خەسـار کـردن ‹ئـەو هـەموو پارچەیەت بۆ حەرام کرد؟› ☰ ۱. حـرام کـردن ۲. مانع شدن ۳. هدر دادن

**لە حەرام گێڕان:** ☜ **حەرام کردن ـ۳**

**حەرامخۆر** / ĥeramxor/: ناو. هەرامومر: ۱. کەسێ کـە خـۆراک و خواردنـەوەی حـەرام دەخـوا ۲. کەسێ کە لە حـەلاڵ و حـەرام ناپرسـێ ☰ ۱و۲. حرامخوار

**حەرامزا** / ĥeramza/: ☜ **حەرامزادە**

**حـەرامزادە** / ĥeramzade/: ناوەڵـناو. حـــەرامزا؛ هەرامزا؛ هەرامزادە: ۱. زۆڵ؛ بیژوو؛ بیچ ۲. *[کینایە]* فێڵباز و بەدفـەڕ . هـەروەها: **حـەرامزادەیی** ☰ ۱. نامشروع ۲. حیلەگر و مردمآزار

**حەربلین** / ĥerb(i)lîn/: چاوگ. ۱. گرێ تێ کەوتن (گوریس و ...) ۲. ئاڵۆزان (بەن و پـەتک) ۳. سـەر لێ شێوان ☰ ۱. گره خوردن (ریسمان و ...) ۲. درهـم شدن (رشته، نخ و ...) ۳. سردرگُم شدن

**حەرسیل** / ĥersîl/: ناو. حەرسیلە؛ بـەردی بناغـەی گۆشەی دیوار ☰ سنگ بنای کُنج دیوار

**حەرسیلە** / ĥersîle/: ☜ **حەرسیل**

**حـەرف** / ĥerf/: نـاو. ۱. *[ڕێـنووس]* پیـت؛ نیشـانی نووسین ۲. *[ڕێزمان]* ئـامراز؛ وشـەیەک کـە تـەنیا لەگـەڵ وشـەیەکی تـردا، بـۆ مانایـەکی تایبـەت دەگوترێ یان دەنووسرێ ☰ ۱و۲. حرف

**حەرفچن** / ĥerfçin/: ناو. پیت‌چن ☰ حروفچین

**حەرەکـەت** / ĥereket/: نـاو. هـەرەک؛ هەرەکـەت؛ هەڕک؛ هەڕەکە؛ هەڕەکەت؛ هەلەکەت؛ جووڵـە؛ جوولە ☰ حرکت

◘ **حەرەکەت کردن:** کەوتنە ڕێ ☰ حرکت کردن

**حەرەم** / ĥerem/: ناو. ژن بۆ مێردی خۆی ‹بێـزارە لە تۆ ئێستە، هەماغووشی عەدووتە/ دونیا کـە دوێنـێ حەرەمی موحتەرەمت بوو «نالی»› ☰ همسر

**حەرەمسـەرا** / ĥeremsera/: نـاو. *[کـۆن]* هنـــدروو؛ هونــدروو؛ ئەنــدەروون؛ شەوەســتێن؛ پــەردەناو؛ پەردەســـــەر؛ بەشــــێک لـــە خـــانووی شـــا و دەسەلاتداران کە شوێنی حەسانەوەی کچ و ژنی ماڵ بووە ☰ حرمسرا

**حەری** / ĥerî/: ☜ **حەڕگ**

**حەریر** / ĥerîr/: ناو. هەریر: ۱. پارچەی ئاوریشـم؛ قوماشی لە هەورێشـم ۲. هەڵـوای دۆشـاو ☰ ۱. حریر ۲. حلوای شیره

**حـەریف**[1] / ĥerîf/: نـاو. ۱. هاوملـــە؛ هاوکێشـــە؛ هاڤرک؛ غەنیم؛ خەنیم؛ هاوبەرە؛ هەڤبەر؛ هەڤبەز؛ وەرد؛ میک؛ شـیەنەچیر؛ هامـاڵ؛ شـێک؛ قـەب؛ قــەبۆ؛ لایـــەنی بەرانبـــەر لـــە ڕکەبـــەرێ یـــان ململانەیەکدا ‹حەریفەکـەی ڕووسـە› ۲. گـراوی؛ خۆشەویست؛ دۆستی ژنی بێ‌مێرد ☰ ۱. حریف ۲. معشوق

**حەریف**[2]: ناوەڵناو. هاوکێش؛ هاوماڵ؛ لف؛ خـاوەنی توانایی بۆ ڕکەبەرکێ لەگەڵ خەنیمدا ☰ همتا

**حەڕاج** / ĥeřac/: ☜ **هەڕاج**

**حـەڕاجـەبازار** / ĥeřacebazar/: نـاو. هـــەڕاجی؛ مەزاتخانە ☰ حرّاجی

**حەڕام** / ĥeřam/: ☜ **حەرام**

**حەڕگ** / ĥeřig/: ناو. قوڕ؛ هەڕگ؛ حەڕی؛ حـەری؛ هەڕی؛ هەڕە؛ خۆڵ و ئاوی تێکەڵاو ☰ گِل

**حـەڕماندن** / ĥeřmandin/: چـاوگ. ۱. بـێ‌بـەش کردن ۲. بە خەسـار دان ☰ ۱. محـروم کـردن ۲. هدر دادن

**حەڕمین** / ĥeřmîn/: چاوگ. ۱. بێ‌بـەش بـوون ۲.

بە خەسار چوون؛ بــە فیــڕۆ چــوون ⬛ ١. محــروم شدن ٢. هدر رفتن

**حەڕی** / ĥeřî/: ☜ **حەڕگ**

**حەز**[١] / ĥez/: ناو. حەژ؛ هەز؛ هــەژ: ١. ئــارەزوو ٢. ئیشتیا؛ واز ٣. دڵداری؛ ئــەوین ٤. دۆســت ⬛ ١. آرزو ٢. اشتها ٣. عشق ۴. دوست

⊡ **حەز کردن**: هەز کــرن: ١. خواســتن؛ بــە تــەما بوون ٢. خۆش هاتن ⬛ ١. خواستن ٢. دوست داشتن

**حەز لێ کردن**: حەژێ کرن: ١. ئــاوات خواســتن ٢. ئەوینــدار بــوون ⬛ ١. آرزو کــردن ٢. عاشــق شدن

**حەز**[٢]: ناوەڵــناو. حەژ؛ هەز؛ هەژ؛ پەسند و لەبــەردڵ ‹شتێکی حەزە› ⬛ پسندیده

• **حەز**[٣]: پاشەوشە. ـ هەز؛ ـ خواز؛ ـ دۆست ‹ئاوحەز› ⬛ ـ خواه؛ ـ دوست

**حەزرەت** / ĥezret/: ناو. ١. سەرناوێکە بۆ ڕێز گرتن لە پێش ناوی پیاوانی گەورە و پیرۆزدا دەگــوترێ ‹حەزرەتــی غــەوس› ٢. ☜ **حــەســرەت** ⬛ ١. حضرت ٢. ☜ **حەسرەت**

**حەزلێکردوویی** / ĥezlêkirdûyî/: ☜ **حەزلێکەری**

**حەزلێکــەری** / ĥezlêkerî/: نــاو. حـــەزلێکردوویی؛ دڵداری؛ ئەوینی نێوان دوو کەس ⬛ عاشقی

**حەزوناحەز** / ĥez û naĥez/: ناو. دۆست و دوژمــن ⬛ دوست و دشمن

**حــەزۆک** / ĥezok/: ناوەڵــناو. هــۆگر و خوازیــار ⬛ علاقەمند

**حەزۆکی** / ĥezokî/: ناو. هۆگری ⬛ علاقەمندی

**حەزەنگ** / ĥezeng/: ناو. خەم؛ خەفەت ⬛ غم

**حەزیا** / ĥezya/: نـاو. هــەژدیها؛ زەهــا؛ حــەفی ⬛ اژدها

**حەزیران** / ĥezîran/: ☜ **حوزەیران**

**حەزیرانی** / ĥezîranî/: نـاو. جۆرێــک هــەرمێ ⬛ نوعی گلابی

**حەزیەت** / ĥezyet/: ناو. ئازار ⬛ اذیت

**حەژ** / ĥej/: ☜ **حەز**

⊡ **حەژێ کرن**: ☜ **حەز لێ‌کردن**

**حەژبەت** / ĥejbet/: ☜ **حەژمەت**

**حەژدە** / ĥejde/: ☜ **هەژدە**

**حەژدەهی** / ĥejdehî/: ناو. کاری دیــدەنی کــردنی بە کۆمەڵ ⬛ دیدوبازدید گروهی

**حەژمــەت** / ĥejmet/: نــاو. حەژبــەت؛ مەینـــەت؛ خەفەت؛ کەسەر؛ خەم؛ کوڵ ⬛ اندوه

⊡ **لە حەژمەت**: لە حەژمــەتان؛ لــە خەفــەتان ⬛ از سر اندوه

**لە حەژمەتــان**: ☜ **لە حەژمەت**

**حــەس**[١] / ĥes/: نــاو. هەســت؛ حــس؛ حــیس ⬛ احساس

⊡ **حەس کرن**: هەست کردن ⬛ احساس کردن

**حەس**[٢]: دەنگ. وشەی سەیر مان ⬛ وَه

**حەساب** / ĥesab/: ☜ **حیساب**

**حەسار** / ĥesar/: ناو. هەسار؛ حەوش؛ گــۆڕایی نــاو چوار دیواری ماڵ ⬛ حیاط

**حەساس**[١] / ĥesas/: ☜ **حەسحەس**

**حەساس**[٢]: ناوەڵناو. هەستۆک ⬛ حساس

**حەساســییەت** / ĥesasîyet/: نــاو. هەســـتۆکی ⬛ حساسیت

**حەســاندنەوە** / ĥesand(i)newe/: چــاوگ. تێــەر. //حەســـاندتەوە؛ دەحەســـێنیەوە؛ بحەســـێنەوە// حەسانن؛ بێ‌خەم کردن؛ ئاسوودە کردن ⬛ آسودە کردن

■ ناوەڵــناوی بــەرکاری: ـــــ/ چــاوگی نــەرێنی: نەحەساندنەوە

**حەسانن** / ĥesanin/: ☜ **حەساندنەوە**

**حەســـانەوە** / ĥesanewe/: چـــاوگ. تێنەپــــەر. //حەسایەوە؛ دەحەسـێیەوە؛ بحەسـێوە// حەسـیان؛

حەسیانەوە؛ حەسینەوە؛ هەسانەڤە؛ هەسانەوە؛ هەسیانەڤە: ۱. لە ماندووەتی ڕزگار بوون ‹ئەگەر ئەمجارە لێک بپسێنەوە/ ئیتر تا مردن ناحەسێنەوە «پیرەمێرد»› ۲. خاترجەم بوون ☰ ۱و۲. آسودن
■ ئاوەڵناوی بەرکاری: حەساوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەحەسانەوە

**حەساو**[1] / ĥesaw/: ☜ **حیساب**

⊡ **حەساو بوون:** هاتنە ئەژمار ‹هەڕەشە و گوڕەشە هیچ نییە ئەوە حەساوە بتوانی کارێ بکەی› ☰ بە حساب آمدن

**حەساو**[2]: ئاوەڵناو. وچان گرتوو ☰ آسوده

**حەساوزان** / ĥesawzan/: ناو. خیفزان ☰ حسابگر

**حەساوکتاو** / ĥesawk(i)taw/: ناو. ۱. حیساب ‹حەساوکتاومان چۆنە؟› ۲. کاری ڕۆشن کردنەوەی حەساو ‹دانیشین حەساوکتاوێ بکەین› ☰ ۱. حساب ۲. حساب‌وکتاب

**حەساوگەر** / ĥesawger/: ناو. فاڵگر؛ حەسێوگەر؛ حیسابگەر؛ فاڵ گرەوە بە تەزبێح ☰ فالگیر

**حەساوە** / ĥesawe/: ئاوەڵناو. ئاسوودە؛ دوور لە ماندوویی ☰ آرمیده

**حەساوی**[1] / ĥesawî/: ناو. کەری سپی و هەرەچاک ☰ خر سفید و چالاک

**حەساوی**[2]: ئاوەڵناو. دروست و بەجێ ‹قسەی حەساوی› ☰ درست

**حەساوی**[3]: ئاوەڵکار. زۆر چاک ‹حەساوی کوتام› ☰ خوب؛ حسابی

**حەسپ** / ĥesp/: ناو. ئەسپ؛ هەسپ ☰ اسب

**حەسپن** / ĥespin/: ئاوەڵناو. شێتی دڵداری ☰ مجنون؛ دلداده

**حەستەم**[1] / ĥestem/: ئاوەڵناو. دژوار؛ سەخت ☰ دشوار

**حەستەم**[2]: ئاوەڵکار. بە دژواری ☰ بە سختی

**حەسحەس** / ĥesĥes/: ناو. حەساس؛ هەسهەس؛ عەسعەس؛ هەساس؛ جەزایرچی؛ پاسەوانی شەو ☰ عسس؛ شبگرد

**حەسرەت** / ĥesret/: ناو. حەزرەت؛ عەزرەت؛ داخ: ۱. سۆ؛ سوێ؛ سوو؛ تاسە؛ ئەفسۆس؛ کەلیلان؛ داخ و کەسەر بۆ شتێک کە لە بەر دەست نییە ‹بە حەسرەت عومری من یەکبارە فەوتا/ مەگەر عومرێ دووبارەم پێ عەتا کەی «نالی»› ۲. ئاواتی بەدی‌نەهاتوو ‹سەر مەنیام وە سای گلکۆی تازەوە/ چەنی حەسرەتان بێ ئەندازەوە «مەولەوی»› ☰ ۱و۲. حسرت

**حەسود** / ĥesûd/: ئاوەڵناو. بەخیل؛ ئێرەیی‌بەر ☰ حسود

**حەسودی** / ĥesûdî/: ناو. بەخیلی؛ ئێرەیی ☰ حسادت

**حەسەس** / ĥeses/: ناو. جەزایەرچی؛ ئێشکچی ☰ عسس

**حەسەنەسستە** / ĥesenesste/: ناو. شمقاڕی بۆر؛ جۆرێکی شمقاڕە لە تۆرەمەی هەڵۆیان ☰ سنقر خاکستری

**حەسیان** / ĥesyan/: چاوگ. ۱. خەوەردار بوون؛ ئاگادار بوون ۲. ☜ **حەسانەوە** ☰ ۱. آگاه شدن ۲. ☜ **حەسانەوە**

**حەسیانەوە** / ĥesyanewe/: ☜ **حەسانەوە**

**حەسیر** / ĥesîr/: ناو. حەسیلک؛ هەسیر؛ هەشیر؛ بووریا؛ ڕایەخی لە جەگەن و قامیش ☰ حصیر

**حەسیرچن** / ĥesîrçin/: ناو. وەستای حەسیر دروست کردن ☰ حصیرباف

**حەسیرمەیدان** / ĥesîrmeydan/: ناو. [کینایە] دارکاری ☰ کتک‌کاری

**حەسیرۆ** / ĥesîro/: ناو. ۱. خەسوو؛ دایکی ژن/ شوو ۲. خەزوور؛ باوکی ژن/ شوو ☰ ۱. مادرزن/ شوهر ۲. پدرزن/ شوهر

**حەسیلک** / ĥesîlik/: ☜ **حەسیر**

**حەسین / ĥesîn/**: چاوگ. پێزانین؛ ئاگادار بوون؛ هەست پێکردن 🇮🇷 آگاه شدن

**حەسینەوە / ĥesînewe/**: ☜ **حەسانەوە**

**حەسێب / ĥesêb/**: ☜ **حیساب**

**. حەسێن / -ĥesên/**: پاشەوشە. خاوەن تایبەتمەندی حەساندنەوە ‹دڵحەسێن› 🇮🇷 آساینده

**حەسێو / ĥesêw/**: ☜ **حیساب**

**حەسێوگەر / ĥesêwger/**: ☜ **حەساوگەر**

**حەش / ĥeş/**: ناو. حش؛ ورچ؛ حرچ 🇮🇷 خرس

◙ **حەشە پەڕۆینە:** *[کنایە، پلار]* چاخی نەپۆڕ 🇮🇷 چاقالو

**حەشار / ĥeşar/**: ناو. هەشار: ١. بۆسە؛ جێگەی خۆ تێدا شاردنەوە ٢. کار و ڕەوتی وەشارتن 🇮🇷 ١. مخفیگاه ٢. عمل پنهان کردن

◘ **حەشار دان:** وەشارتن؛ شاردنەوە؛ ڤەشارتن ‹چ سرڕێکت لە ناو دڵدا حەشار داوە بە پەنهانی/ کە چاوت چەشنی ئاوێنە وەها بێپەردە درکانی «ئەحمەد هەردی»› 🇮🇷 پنهان کردن

**حەشاردراو / ĥeşard(i)raw/**: ئاوەڵناو. شاردراوە؛ شێراوە؛ ڤەشارتی 🇮🇷 مخفی‌شده

**حەشارگا / ĥeşarga/**: ☜ **حەشارگە**

**حەشارگە / ĥeşarge/**: ناو. حەشارگا؛ هەشارگە؛ ڕەبەت؛ بۆسە؛ جێگەی شاردنەوە 🇮🇷 مخفیگاه

**حەشامات / ĥeşamat/**: ناو. حەشیمەت؛ حەشامەت؛ عەشامات؛ هەشامات؛ ئاپۆرەی خەڵک؛ کۆمەڵی زۆر لە خەڵک 🇮🇷 تودەی مردم

**حەشامەت / ĥeşamet/**: ☜ **حەشامات**

**حەشت / ĥeşt/**: ☜ **هەشت**

**حەشتێ / ĥeştê/**: ☜ **هەشتا**

**حەشر / ĥeşr/**: ناو. هەشر: ١. *[ئیسلام]* سەڵا؛ پسات؛ قیامەت ٢. *[کنایە]* هەرا و هوریای تێکەڵوپێکەڵ ‹جە دووری یاران بێقەراریشەن/ واوەیلا و حەشر و شین و زاریشەن «فولکلۆر»› 🇮🇷 ١. قیامت ٢. جار و جنجال

◙ **ڕۆژی حەشر:** *[ئیسلام]* ڕۆژی قیامەت؛ ئەو ڕۆژە خوادا هەموو زیندوو دەکاتەوە و بە حیسابی چاکە و خراپەیان ڕادەگا ‹لە ڕووی تۆدا نەما، پەروای شەهیدانی نەبوو چاوت/ لە ڕۆژی حەشرێ ناترسێ، عەجەب تورکێکی بێباکە! «وەفایی»› 🇮🇷 روز حشر

◘ **حەشر کردن:** ١. *[ئیسلام]* قیامەت بەر پا کردن ‹سوێندم بەو ڕۆژە حەشرمان دەکەن› ٢. حەشر پێ کردن؛ کارێکی ئەوتۆ و گرینگ کردن ‹چەپڵەڕێزان و هووڕای حەشامەتەکە حەشری دەکرد. هەمووی داخ لە دڵ لە عەرەب، لە بۆمبا و تەیارەی ڕووس «هەژار، چێشتی مجێور»› 🇮🇷 ١. قیامت بر پا کردن ٢. کارِ کارستان کردن

**حەشر پێ کردن:** ☜ **حەشر کردن ـ٢**

**حەشروحەلا / ĥeşr û ĥela/**: ☜ **حەشروحەلەلا**

**حەشروحەلەلا / ĥeşr û ĥelela/**: ناو. حەشرەلا؛ حەشر و حەلا؛ هەرا و زەنا؛ چەقە و گوڕە ‹پاش نوێژی شێوانێک، بە بزنەگەلەوە ڕوومان کردە گوندێک بێورە یان بێورانیان پێ دەگوت. حەشروحەلەلا بوو، دیار بوو شێواوە ... «هەژار، چێشتی مجێور»› 🇮🇷 جار و جنجال

**حەشفاندن / ĥeşfandin/**: چاوگ. دەراوێتن؛ لە ڕیزەوە دەرنان؛ ڕەش کردنەوە 🇮🇷 حذف کردن

**حەشکاندن / ĥeşkandin/**: چاوگ. ڕێک گوشین؛ وشین 🇮🇷 فشردن

**حەشکۆڵە / ĥeşkołe/**: ناو. بەچکەورچ؛ بەچکەحرچ؛ بێچووەورچ؛ بێوەڵەورچ 🇮🇷 تولەخرس

**حەشمەت / ĥeşmet/**: ناو. ١. شەرمەزاری؛ تەریقی ٢. پەژیوانی 🇮🇷 ١. شرمندگی ٢. پشیمانی

**حەشمەتی / ĥeşmetî/**: ناو. پەشیمانی 🇮🇷 پشیمانی

**حەشەرەڵا / ĥeşerela/**: ☜ **حەشروحەلەلا**

**حەشەری / ĥeşerî/**: ئاوەڵناو. هەشەری؛ زەنەک؛

حەکــەدار؛ هەکــەدار؛ بەئالــۆش؛ هەیشــۆ؛ زۆر تینووی سەرجێیی کردن 🇮🇷 حشری

**حەشەنوورە** / ĥeşenûre/: ناو. گیایەکە لـە تـووتن دەکا و بڕێ جار وەک تووتن دەکێشرێ 🇮🇷 گیاهی شبیه توتون

**حەشیش** / ĥeşîş/: ☜ حەشیشە

**حەشیشە** / ĥeşîşe/: ناو. بەنگ؛ حەشیش؛ چـەرس 🇮🇷 حشیش

**حەشیفاندن** / ĥeşîfandin/: چـاوگ. نووســـین؛ نڤیسین 🇮🇷 نوشتن

**حەشیمەت** / ĥeşîmet/: ☜ حەشامات

**حەف**[1] / ĥef/: ناوەڵناو. حەفار: ١. بۆگەن ٢. گـەنیو 🇮🇷 ١. بدبو ٢. گندیده

**حەف**[2]: دەنگەناو. حەفار؛ حەپ 🇮🇷 پارس سگ

**حەفار**[1] / ĥefar/: ناو. هەڵم؛ بۆق 🇮🇷 بُخار

**حەفار**[2]: ☜ حەف

**حەفت** / ĥeft/: ☜ حەوت

**حەفتئاو** / ĥeft'aw/: ☜ حەفتاو

**حەفتا**[1] / ĥefta/: نـاو. حــەوتا؛ هــەفتا؛ حــەفتێ؛ هەفتێ؛ هاوتای؛ هۆوتای؛ هەوتای؛ شێست و دە؛ حەو جار دە 🇮🇷 هفتاد

**حەفتا**[2]: ناوەڵناو. حـەوتا دانـە؛ یـەکێک زیـاتر لـە شێستونۆ دانە 🇮🇷 هفتاد

**حەفتار** / ĥeftar/: ناو. کەمتیار 🇮🇷 کفتار

**حەفتامین** / ĥeftamîn/: ناوەڵناو. هەوتاین؛ بە ڕیز و پلەی حەفتایەمەوە 🇮🇷 هفتادمین

**حەفتانە**[1] / ĥeftane/: ناوەڵناو. هەفتانـە؛ هـەفتانی؛ حەوتانە؛ حەوتوانە؛ بە حەفتە؛ حەفتەـ حەفتە؛ لە درێژایی حەوتوودا ‹کاری حەفتانە› 🇮🇷 هفتگی

**حەفتانە**[2]: ناوەڵکار. هەفتانە؛ حەوتانە؛ حەوتوانە؛ لە حەفتەدا ‹حەفتانە دێتە لام› 🇮🇷 هفتگی

**حەفتاو** / ĥeftaw/: نـاو. حەفتئاو؛ حەتئاو؛ ژاراڤ؛ کاری حەو جار شتنەوەی شتێک نەجسـی پێـوە تلاوە، بـە قـوڕاو بـۆ پـاک بوونـەوەی. هـەروەها: **حەفتاو کێشان** 🇮🇷 عمل هفت آب شستن

**حەفتاهەم** / ĥeftahem/: ☜ حەفتایەم

**حەفتایـەم** / ĥeftayem/: جێنـاو. حەفتاهـــەم؛ حەفتایەمین 🇮🇷 هفتادمین

**حەفتایەمین** / ĥeftayemîn/: ☜ حەفتایەم

**حەفتبرا** / ĥeftb(i)ra/: ☜ حەوتەوانان

**حەفتبرالێ** / ĥeftb(i)ralê/: ☜ حەوتەوانان

**حەفتتۆخە** / ĥefttoxe/: ناو. پیفـۆک؛ پیشـۆک 🇮🇷 گیاهی با پیاز خوردنی

**حـەفتتیر** / ĥefttîr/: نـاو. حــەوتیر؛ دەمانچــە 🇮🇷 هفت‌تیر

**حـەفتتیرکێش** / ĥefttîrkêş/: نـاو. دەمانچــەکێش: ١. ئەوەی دەمانچە دەبەستێ ٢. کەسـێ کـە بـە زۆری چـــەک کـــاری بـــەڕێوە دەبـــا 🇮🇷 ١و٢. هفت‌تیرکش

**حەفتجۆش** / ĥeftcoş/: ☜ حەوجۆش

**حەفتخشتەکی**/ ĥeftxiştekî/: ☜ حەوتخشتەکی

**حەفتڕۆح** / ĥeftřoĥ/: ناوەڵناو. *[کینایە]* سەگ گیـان؛ گیان‌سەخت 🇮🇷 هفت‌جان

**حەفتڕەنگ**[1] / ĥeftřeng/: نـاو. جـۆرێ مەخمـەری ڕێ ـ ڕێ 🇮🇷 نوعی مخمل

**حەفتڕەنگ**[2]: ناوەڵناو. دووڕوو؛ ڕووبین 🇮🇷 دورو

**حەفتڕەنگە** / ĥeftřenge/: ناو. حەوترینگە؛ فیـل و فیلەتەن؛ چێشتێکە لە نیسک و نـۆک و گـەنم و کشمیش و قەیسی و سماق 🇮🇷 از غذاها

**حەفتڕەنگیلە** / ĥeftřengîle/: نـاو. کاسەڵەشـینکە؛ حەوتڕەنگیلـە؛ ڕەنگـڕێژە؛ باڵـداریکە بـە چەنـد ڕەنگ 🇮🇷 سبزقبا

**حەفتسین** / ĥeftsîn/: نـاو. حەوسین؛ حەوت ماکی وا، کە ناویان بە سینەوە دەسـپێدەکا (وەک سـێو، سەوزە، سنجوو، سماق، سەمەنوو، سیر و سرکە) و لە سەر سفرەی ساڵی تازەوە بۆ مبارەکی دایـدەنێن

ﷺ هفتسين

**حەفتم** / ĥeftim/: ☜ **حەوتم**

**حەفتوک** / ĥeftuk/: ☜ **حەفتۆخ**

**حەفتۆخ** / ĥeftox/: ناو. *[مەجازی]* حەفتوک؛ کوانێکی ڕەقە درەنگ چاک دەبێتەوە ﷺ دملی بدخیم

**حەفتە** / ĥefte/: ناو. حەوتە؛ هەفتە؛ هەوی؛ حەوتوو؛ حەفتێ؛ یەکەی ئەندازە گرتنی کات بەرامبەر بە حەوت شەو و ڕۆژ لە شەممەوە تا هەینی ﷺ هفته

**حەفتەبیجاڕ** / ĥeftebîcař/: ناو. ١. ☜ **حەوترینگە** ٢. جۆرێ ترشی کە چەن جۆر سەوزە و میوەی تێ دەجنن ﷺ ١. ☜ **حەوترینگە** ٢. هفتەبیجار

**حەفتەکۆک** / ĥeftekok/: ناو. جۆرێ سەعات کە حەوتەی جارێک قورمیش دەکرێ ﷺ نوعی ساعت که هفته‌ای یک بار کوک می‌شود

**حەفتەکێش** / ĥeftekêş/: ناو. حەوتەکێش؛ کاری کێشانی ماین لە ئەسپ لە حەوتەی زانیدا ﷺ کشش مادیان از اسب در هفته‌ی زادن

**حەفتەمین** / ĥeftemîn/: ☜ **حەوتەمین**

**حەفتەوانان** / ĥeftewanan/: ☜ **حەوتەوانان**

**حەفتەوانە** / ĥeftewane/: ☜ **حەوتەوانان**

**حەفتەیی**[1] / ĥefteyî/: ناوەلناو. حەوتوویی؛ حەفتانە؛ حەوتانە؛ هەفتانە: ١. پێوەندیدار یان بۆ یەک حەوتە ‹مزی حەفتەیی› ٢. سەر بە حەفتە ‹کاری حەفتەیی› ﷺ ١و٢. هفتگی

**حەفتەیی**[2]: ناوەلکار. حەوتوویی؛ حەفتانە؛ بە حەوتە؛ حەفتە ـ حەفتە؛ لە درێژایی حەوتوودا ‹حەفتەیی مز دەگرم› ﷺ هفتگی

**حەفتێ** / ĥeftê/: ناو. ١. ☜ **حەفتا** ٢. حەفتە؛ حەوتە ﷺ ١. ☜ **حەفتا** ٢. هفته

**حەفجۆش** / ĥefcoş/: ☜ **حەوجۆش**

**حەفحەفی** / ĥefĥefî/: ناوەلناو. *[پلار]* زۆرخۆری بەلەز خۆر ﷺ پُرخور حریص

**حەفس** / ĥefs/: ☜ **هەپس**

**حەفسە** / ĥefse/: ☜ **حەوسەد**

**حەفسەد** / ĥefsed/: ☜ **حەوسەد**

**حەفقاس** / ĥefqas/: ☜ **هەفقاس**

**حەفک** / ĥefk/: ناو. ئەوک؛ قورگ؛ گەروو ﷺ گلو

**حەفلچ** / ĥefliç/: ناو. لێوکەت ﷺ لبشکری

**حەفی** / ĥefî/: ناو. ١. هەژدیها؛ حەزیا؛ زەها ٢. ماری زل ٣. *[پلار]* زۆرخۆر ﷺ ١. اژدها ٢. افعی ٣. پُرخور

**حەفیان**[1] / ĥefyan/: ☜ **حەفین**

**حەفیان**[2]: ناو. ١. حەزیا؛ هەژدیها ٢. *[پلار]* زۆرخۆر ﷺ ١. اژدها ٢. پرخور

**حەفین** / ĥefîn/: چاوگ. حەفیان؛ وەڕین؛ حەپین ﷺ پارس کردن

**حەڤدە** / ĥevde/: ناو. هەڤدە؛ هەڤدە؛ هاوتێس؛ هەوتێس؛ دە و حەوت ﷺ هفده

**حەڤدەم** / ĥevdem/: ☜ **حەڤدەهەم**

**حەڤدەمین** / ĥevdemîn/: ناوەلناو. حەڤدەم؛ حەڤدەهەمین؛ بە ڕیز، ڕزن، پلە یا جێگای حەڤدەهەمەوە ﷺ هفدهمین

**حەڤدەهەم** / ĥevdehem/: ناوەلناو. حەڤدەم؛ هاوتێسن؛ بە ڕیز، ڕزن، پلە یا جێگای حەڤدەوە ﷺ هفدهم

**حەڤدەهەمین** / ĥevdehemîn/: ☜ **حەڤدەمین**

**حەق**[1] / ĥeq/: ناو. هەق: ١. خودا ‹هیچ هۆشت نیەن حەق خەبەردارەن/ فەردا ڕۆی حیساب میزان کارەن «مەولەوی»› ٢. کرێ؛ مز؛ کرها ‹حەقی داس، بدە کراس «مەسەل»› ٣. نرخ؛ قیمەت ‹حەقی ڕۆژێ کار چەندە؟› ٤. حەقیقەت؛ ڕاستی ‹وا خەریکە شەبەق ئەدا/ کەڵەشێر بانگی حەق ئەدا «گۆران»› ٥. کار و پەیوەندی ‹حەقێکم پێوە نییە؛ تۆ حەقت نەبێ!› ٦. هەڕەت؛ جەنگە ٧. تۆڵە

‹حـەق كردنـەوە› ٨. قـەرەبوو ‹حـەق دانـەوە› ٩. ئیختیار ‹حەقی خۆیە، چ دەکا با بیکا› ☰ ١. خدا ٢. مُزد ٣. قیمت ۴. حقیقت ۵. ربط ۶. عنفوان ٧. انتقام ٨. جبران ٩. اختیار

⊡ **حەق بە سەر كەسێكەوە بوون:** بە ئـەنجامدانی خزمەتێکی شیاو کەسێ منەتباری خـۆ کـردن ☰ حق بر کسی داشتن

**حەق پێ دان:** مـاف دان؛ بـۆی بـە ڕەوا زانـین ‹حەقت پێ دەدەم داوای بەشی خۆت بکـەی› ☰ حق دادن

**حەق ساندنەوە:** تۆڵە ساندن؛ حەیف هەڵانین ☰ انتقام گرفتن

**حـەق كردنـەوە:** ١. قـــەرەبوو دان ٢. تۆڵـــە سەندنەوە ☰ ١. تلافی کردن ٢. انتقام گرفتن

**حەق گوتن:** ڕاست وتن ‹ئازاد حەقی دەگـوت، تـۆ پیاوی کار نیت!› ☰ راست گفتن

**حەق ناحەق كردن:** شیر بـە قـیر کـردن؛ دژ بـە ڕاستی و دروستی کارێ کردن ‹دەتەوێ بەرتیل بدەی حەق ناحەق کەی؟!› ☰ حق را ناحق کردن

**حەقی كەسی خواردن:** مافی کەسێ ژێرپا کـردن؛ ئەوەی هی کەسێکە بردن و پێ نەدانەوە ‹دوای بابی حەقی خوشکەکانی خوارد› ☰ حق کسـی را خوردن

**حـــەقی كەســـێ نانـــە مشـــتییەوە:** ١. بـــــە سووکایەتییەوە جیرەی کەسێ پێ دان؛ قەرزی کەسێ دانەوە ٢. *[کینایە]* جزیـا دانـەوە؛ کـاری نارەوای کەسێ تۆڵە کردنەوە ☰ ١و٢. حق کسی را کف دستش گذاشتن

**حەقی خۆی بوون:** حەقی/ مافی کەسێ بوون؛ بـۆ کەسێ ڕەوا بوون ‹حەقی خۆیە لێت تـوورە بـێ› ☰ حق کسی بودن

**حەقی كەسێ بوون:** ☜ **حەقی خۆی بوون**

**حـەقی کـەسێ/ شتێ بـەجێ هێنـان:** کــار یــان ئەرکێکی شیاو بۆ شت/ کەسێ بـەجێ هێنـان ‹حەقی برایەتی بـەجێ هێنـاوە› ☰ حـق کسـی/ چیزی را ادا کردن

(**خاوەن) حەق بوون:** (خـاوەن) مـاف هـەبوون؛ بەحەق بوون ‹دەبێ بزانی تۆ لەو ماڵـەدا حـەقت هەیە› ☰ روا بودن

**لە حەق لا نەدان:** ڕاست گـوتن ‹بـە حـەق هـەر حەق، بە ناحـەق ناحـەقم وتـووە لـە ڕۆژێ بـووم/ وەکوو مەنسوور ئەگەر بیشمکوژن ناکەم لـە حـەق لادەم «مەحوی»› ☰ از حق نگذشتن

**حەق**[٢]: ئاوەڵـناو. هـەق؛ دروسـت؛ ڕاسـت؛ ڕێـک ‹قسەی حەق ڕەقە «مەسەل»› ☰ حق؛ درست

⊡ **حەق بوون:** ڕاسـت و ڕەوا بـوون؛ بەرامبـەر بـە قانوون یا شەرع بوون ‹گشـت قسـەکانی حـەق بوو›. هەروەها: **حەق گوتن** ☰ حق بودن

**حەقانی** / ĥeqanî/: ئاوەڵناو. ڕاسـت و دروسـت ☰ درستکار

**حەقانییەت** / ĥeqanîyet/: ناو. هەقانەت؛ ڕاستی و پاکی ‹بە حەقانییەتـی خوا قەسەم› ☰ حقانیت

**حەقایەت** / ĥeqayet/: ناو. حیکایەت؛ چـیرۆک ☰ حکایت

**حەقایەتخوان** / ĥeqayetx(i)wan/: ناو. مێژبێژ ☰ حکایتخوان

**حەقبەدەست** / ĥeqbedest/: ئاوەڵـناو. بەرحـــەق؛ خاوەنحەق ☰ برحق

**حەقبێژ** / ĥeqbêj/: ئاوەڵـناو. ڕاسـتبێژ؛ ڕاسـتۆخ ☰ حقگو

**حەقحەقكەرە** / ĥeqĥeqkere/: نـاو. تاقتاقکـــەرە؛ تاقتـــاق؛ حەقحـــەقۆک؛ تووتـــاک؛ پەلـــەوەرێکی بچووکە بە پەڕی خۆڵەمێشییەوە، مێـروو دەخـوا، زۆرتر شەوانە دەخوێنێ و دەنگێکی تایبەتی هەیە ☰ مُرغ حق

**حەقحەقۆك** / ĥeqĥeqok/: ☜ **حەقحەقكەرە**

**حەقدەس / ĥeqdes/**: ناو. حەقدەست؛ مز؛ مژ؛ کارانە؛ جەمەک مُزد

**حەقدەست / ĥeqdest/**: ☜ **حەقدەس**

**حەقکوژی / ĥeqkujî/**: ناو. پێشێل کاری؛ کار و ڕەوتی پێشێل کردنی مافی کەس یان کەسانێک ‹ئوستادم وەی تەور کردن تەعلیمم/ حەقکوژی (حەقکوشی) نیەکەم تا ئاخر نەفەس «شامی»› حقکُشی

**حەقلەمەقۆ / ĥeqlemeqo/**: ناو. مرخێس؛ هەرا و چەقە دادوقال

**حەقلیمەقۆ / ĥeqlîmeqo/**: ناو. ١. گەمەی پشکیلان ٢. هەلەق‌مەلەق؛ حندرحۆ ٣. *[پلار]* هەرا و زەنا ١. بازی پشک انداختن ٢. الاکلنگ ٣. جار و جنجال

**حەقلیمەمان / ĥeqlîmeman/**: ☜ **حەقلیمەمۆ**

**حەقلیمەمۆ / ĥeqlîmemo/**: ناو. حەقلیمەمان؛ حەقڵیمەمان؛ حەقڵیمەمۆ؛ جۆرێ گاڵتە نوعی بازی

**حەقڵیمەمان / ĥeqłîmeman/**: ☜ **حەقلیمەمۆ**

**حەقڵیمەمۆ / ĥeqłîmemo/**: ☜ **حەقلیمەمۆ**

**حەقناس / ĥeqnas/**: ئاوەڵناو. ئەمەگ‌ناس؛ پێزان قدرشناس

**حەقوڵڵا / ĥequłła/**: ناو. حەقی خوا؛ ئەرکی سەر شانی هەر کەسێک لە هەمبەر خوداوە (وەک: بەندایەتی) حق‌الله

**حەقوناس / ĥequnas/**: ناو. حەق و مافی خەڵک؛ ئەرکێ کە هەر کەس لە هەمبەر کەسانی‌ترەوە لە سەر شانیەتی (وەک: قەرز) حق‌الناس

**حەقەپەڵە / ĥeqepeļe/**: ناو. هەڕەتی بارانی پاییز موسم بارش پاییزی

**حەقەوەسێن / ĥeqewesên/**: ناو. ١. تۆڵەکەرەوە ٢. قەرەبووکەرەوە ١. انتقام‌گیرنده ٢. تلافی کننده

**حەقیقەت / ĥeqîqet/**: ناو. حەق؛ ڕاستی حقیقت

**حەک¹ / ĥek/**: ناو. کاری هەڵپڕیواندن؛ هەڵکڕاندن عمل حک کردن

**حەک²**: دەنگ. دەک: ١. وشەی پەسن یان تووک ‹حەک نەمری!؛ حەک داوەشی!› ٢. وشەی سەرسووڕمان ‹حەک لەو دەست و نیشانە!› ١. کلمەی مدح یا ذم ٢. وه

**حەکاک / ĥekak/**: ناو. کەندەکار؛ کەندۆخ؛ مۆرهەڵقەن حکاک

**حەکایەت / ĥekayet/**: ناو. چیرۆک حکایت

**حەکە / ĥeke/**: ناو. ئاڵۆش: ١. خورووی لەش ٢. *[پلار]* حەزی جنسی ١. خارش پوست ٢. میل جنسی

**حەکەدار / ĥekedar/**: ☜ **حەشەری**

**حەکیم¹ / ĥekîm/**: ناو. ١. پزیشک؛ بژیشک ٢. پزیشکی بێ‌خوێندنی زانستگایی ٣. دەردزان ١. پزشک ٢. حکیم ٣. دردآشنا

**حەکیم²**: ئاوەڵناو. خاوەن توانایی وزە پێ دان و چاک کردنەوەی نەخۆشی (بۆ چێشت و خۆراک) ‹بیخۆ! حەکیمە› شفابخش

**حەگال / ĥegal/**: ناو. ١. عەگاڵ؛ پەتی سەری عارەبان ٢. لەچکە؛ سەرپۆشی ژنان ١. عقال ٢. روسری

**حەل¹ / ĥel/**: ناو. ١. ڕەوتی توانەوەی ماکێک لە تراوێکدا ٢. هەل؛ وەخت؛ کات ‹حەیفی ئەو حەلە نەهاتی!› ٣. کاری هەڵێنان و دۆزینەوەی مەتەڵ، گرفت یان پرسیارێک ٤. هەلووک؛ دارەکولەی یاری هەلووکان ١. حل ٢. هنگام ٣. حل ٤. چوب کوتاه الک‌دولک

⊡ **حەل بوون** ١. توانەوە؛ تاوانەوە ‹شەکر لە ناوی گەرمدا باشتر حەل دەبێ› ٢. هەڵهاتن؛ بە دەس هاتنی پەرسفی لیچار و مەتەڵۆک ‹مەتەڵی وا دژوار بە کەس حەل نابێ›. هەروەها: **حەل کردن**

🇮🇷 ۱و۲. حل شدن

**حەڵ**[2]: ئاوەڵناو. ۱. دروست؛ ڕاست ‹ئەم قسەت حەڵ نەبوو› ۲. شیاو ‹تۆ حەڵ نی لەم گەمەیەدا› 🇮🇷 ۱. درست ۲. شایان

**حەلاج / ĥelac/**: ناو. هەلاج؛ ڤەبسکور؛ کولکە و پەمۆ شیکەرەوە بە کوتک و کەوان 🇮🇷 حلاج؛ پنبەزن

**حەلاقی / ĥelaqî/**: ناو. جۆرێ ترێ 🇮🇷 نوعی انگور

**حەلان**[1] **/ ĥelan/**: چاوگ. حەلیان؛ تاوانەوە 🇮🇷 ذوب شدن

**حەلان**[2]: ناو. حەلیان؛ تاوێر؛ جالە 🇮🇷 سنگ غلتان از کوه

**حەلاندن / ĥelandin/**: چاوگ. تاواندنەوە؛ تواندنەوە 🇮🇷 ذوب کردن

**حەلانە / ĥelane/**: ناو. تـوڵا خورمـای دە پۆشـەوە پێچراو 🇮🇷 خرمای بستەبندی شدە

**حەلاوحەلاو / ĥelawĥelaw/**: دەنگەناو. هانـەی سەگ بۆ تێبەردانی لە گورگ 🇮🇷 تحریک سگ برای حملە بە گرگ

**حەلحەلە / ĥelĥele/**: ناو. تەشـقی ئاسمـان 🇮🇷 اوج آسمان

**حەلقە / ĥelqe/**: ناو. حەڵـقە: ۱. ئاڵـقە؛ گـەو ۲. کلکەوانـەی دەزگـیرانی 🇮🇷 ۱. حلقـە ۲. حلقـەی نامزدی

▣ **حەلقە دان**: ۱. بە دەوری یـەکترەوە دانیشـتن ۲. دەورە دان؛ لە دەوری شتێ کـۆوە بـوون 🇮🇷 ۱. دور هم نشستن ۲. چیزی را دورە کردن

**حەلک**[1] **/ ĥelik/**: ناو. گاڵـتە؛ جەفـەنگ؛ قسـەی خۆش 🇮🇷 بذلە

**حەلک**[2]: ئاوەڵناو. قسەخۆش 🇮🇷 بذلەگو

**حەلکی / ĥelkî/**: ئاوەڵناو. هێژا؛ بەنرخ 🇮🇷 ارزشمند

**حەللو / ĥellû/**: ناو. هەلووکێن 🇮🇷 الک‌دولک

**حەللەق / ĥelleq/**: ناو. قسەی قۆڕ 🇮🇷 حرف مفت

**حەللەق ـ مەللەق / ĥelleq melleq/**: ☜ حەلەق ـ مەلەق

**حەللەلا / ĥellela/**: دەنگ. پەکوو 🇮🇷 وا

**حـەلوا / ĥelwa/**: نـاو. ۱. ☜ هـەڵوا ۲. ☜ گەرگەری

▣ **حەلوای بەشەقان**: جۆرێ گەمە 🇮🇷 نوعی بازی

**حـەلواچی / ĥelwaçî/**: نـاو. هەڵـوافرۆش 🇮🇷 حلوافروش

**حەلوایی / ĥelwayî/**: ئاوەڵناو. بـە ڕەنگـی هەڵـوا؛ سووری تۆخ 🇮🇷 بە رنگ حلوا

**حـەلوەلا / ĥelwela/**: نـاو. پەلەپـەل و تەنگانـە ‹ئـەوەن تینـووم بـە لێـوی تـۆ، بـە شـیریش گـەر لەتوکـوت بم/ تەسـەللامە بـە ئـاوی تیـغ و ڕۆحـم حەلوەلا ناکا «قانع»› 🇮🇷 عجلە

**حەلۆ / ĥelo/**: لێل. ← **حەلۆجەلۆ**

**حەلۆجـەلۆ / ĥelo celo/**: نـاو. گەجەرگوجـەر؛ عەلووجەلوو؛ لاتولووت؛ خەڵـکی بـێسـەروپا 🇮🇷 رجالە

**حەلو / ĥelû/**: ☜ **هەڵوژە**

**حەلوچک / ĥelûçik/**: ☜ **هەڵوژە**

**حەلوک / ĥelûk/**: ☜ **هەڵوژە**

**حەلوکە / ĥelûke/**: ☜ **هەڵوژە**

**حەلـەب / ĥeleb/**: ئاوەڵـناو. حـەلیب؛ حـەلێو: ۱. وەرگـیراو؛ پەسـند ‹ئـەمجار تـۆیش حەلـەب› ۲. گونجـاو؛ ڕەوا ‹ئـەم کـارەت حەلـەب نـەبوو› 🇮🇷 ۱. پذیرفتە ۲. روا

**حەلەقمەلەق/ ĥeleqmeleq/**: ناو. حەللەق ـ مەللەق؛ هەلەق ـ مەلەق: ۱. حیندرحۆ؛ حندحۆ؛ هیلاهۆپ؛ ئەمسەر ـ ئەوسەر ۲. قسەی قـۆڕ 🇮🇷 ۱. الاکلنـگ ۲. حرف مُفت

**حەلەلا / ĥelela/**: ناو. هەرا ـ هەرا 🇮🇷 جنجال

**حەلەلە / ĥelele/**: دەنگەناو. دنەی سەگ بۆ تێبەر بوون 🇮🇷 تشجیع سگ برای حملە

**حەلەم / ĥelem/**: ناو. ١. ئازار؛ دەرد ٢. عەیب؛ زەدە ☰ ١. الم ٢. عیب و زدگی

**حەلەوێن / ĥelewên/**: ناو. مێشێن ☰ تیلەبازی

**حەلی / ĥelî/**: ئاوەڵناو. هەلی؛ زڕ ‹کوڕ حەلی› ☰ ناتنی

**حەلیان / ĥelyan/**: ☜ حەلان

**حەلیب / ĥelîb/**: ☜ حەلەب

**حەلیم / ĥelîm/**: ناو. حەڵیم: ١. کەشکەک؛ هەریسە؛ هەلیسە؛ چێشتێ لە گەنم و گۆشتی کوتراو کە دارچین، شەکر و ڕۆنی بە سەردا دەکەن ٢. فەریکەکەشک ☰ ١. حلیم ٢. نوعی کشک

**حەلیماو / ĥelîmaw/**: ناو. هەلیماو؛ برنجی لە ئاودا کولاو؛ شۆربای برنج بێ ڕۆن ☰ آش برنج

**حەلین / ĥelîn/**: چاوگ. توانەوە؛ تاوانەوە ☰ حل شدن

**حەلێحەلێ / ĥelêĥelê/**: ناو. گەمەیەکی تازەلاوانە ☰ از بازی‌های نوجوانان

**حەلێو / ĥelêw/**: ☜ حەلەب

**حەڵاڵ / ĥelał/**: ئاوەڵناو. [ئیسلام] هەلال؛ هەلاڵ: ١. ڕێ پێ دراو بە فەرمانی شەرع. هەروەها: حەلاڵ بوون؛ حەلاڵ کردن ٢. ڕەوا؛ دروست ✱ بەرانبەر: حەرام ☰ ١و٢. حلال

**حەڵاڵزادە / ĥelałzade/**: ئاوەڵناو. هەلالزادە؛ هەلالزادە: ١. [ئیسلام] مندالی لە ژن و مێردی شەرعی ٢. [مەجازی] درووسکار؛ دروستکار ✱ بەرانبەر: حەرامزادە ☰ ١. حلالزادە ٢. درستکار

**حەڵاڵگۆشت / ĥelałgoşt/**: ئاوەڵناو. [ئیسلام] گۆشتحەلال؛ حەلالگۆشت؛ خاوەنی گۆشتێ کە شەرع خواردنی بە ڕەوا زانیوە. بەرانبەر: حەرامگۆشت ☰ حلال گوشت

**حەڵاڵ و حازر / ĥelał û ĥazir/**: ئاوەڵناو. لەبەرچاو و ئامادە ☰ حیّ و حاضر

**حەڵق / ĥełq/**: ناو. گەروو ☰ حلق

**حەڵقە / ĥełqe/**: ☜ حەلقە

**حەڵڵادۆشکە / ĥelładoşke/**: ☜ حەڵڵادۆشە

**حەڵڵادۆشە / ĥelładoşe/**: ناو. حەڵڵادۆشکە؛ حەلـلاقووجکە؛ حەلـلاقووچکە؛ حینـدرحۆ؛ هەلەقمەلەق ☰ الاکُلنگ

**حەڵڵاقووجکە / ĥełłaqûcke/**: ☜ حەڵڵادۆشە

**حەڵڵاقووچکە[١] / ĥełłaqûçke/**: ☜ حەڵڵادۆشە

**حەڵڵاقووچکە[٢]**: ئاوەڵناو. بە سەر یەکا دراوی قووچەوە بوو ☰ انباشته

**حەڵەبی / ĥełebî/**: ناو. تەنەکە؛ حەڵەوی؛ پەڕەیێکی ناسکی ئاسن کە بە توێژێکی قەلا داپۆشراوە ☰ ورق حلبی

**حەڵەوی / ĥełewî/**: ☜ حەڵەبی

**حەڵیم / ĥełîm/**: ☜ حەلیم

**حەم / ĥem/**: ناو. [منداڵانە] کاری خواردن لە زاراوەی منداڵاندا ☰ عمل خوردن به زبان کودکانه

▣ **حەم کردن**: [منداڵانە] خواردن ‹ئەوە پفەی تۆیە حەمی کە!› ☰ خوردن

**حەماڵ / ĥemał/**: ناو. حەنباڵ؛ حەنبەڵ؛ عەنبار؛ عەنباڵ؛ هەماڵ: ١. عەمباڵ؛ مرۆی بارهەڵگر ٢. کاریتە؛ تیرحەماڵ ٣. داری لای دیوار بۆ بن کاریتە ☰ ١. حمّال ٢. بالار ٣. ستون

**حەماڵی / ĥemałî/**: ناو. بارکێشی ☰ حمّالی

**حەمام / ĥemam/**: ناو. ١. شوێنی خۆ شۆردن ٢. [کینایە] جێگا (بەتایبەت ماڵ)ی زۆرگەرم ☰ ١و٢. حمام

▣ **حەمامی ژنانە**: [پلار] شوێنی قەوغا و پرزەنا ـ زەنا و کەس‌لەکەس ☰ بازار شام

▣ **حەمام کردن**: چوونە حەمام ☰ حمام گرفتن

**کردنە حەمام**: [کینایە] زۆر گەرم کردن ☰ بسیار گرم کردن

**حەمامچی / ĥemamçî/**: ناو. کەسێ کە بە سەر

حەمام ڕادەگا ☰ حمامی

**حەمامۆک / ĥemamok/**: ناو. حەمامۆکە؛ حەمامۆکێ؛ گەمە بە خۆڵ و خاک کردنی منداڵان کە خۆڵ وەک گومبەز لێ دەکەن ☰ نوعی خاکبازی

**حەمامۆکە / ĥemamoke/**: ☜ **حەمامۆک**

**حەمامۆکێ / ĥemamokê/**: ☜ **حەمامۆک**

**حەمایڵ / ĥemayił/**: ☜ **حەمایەڵ**

**حەمایەت / ĥemayet/**: ناوەڵناو. لینی؛ ماڵی؛ کەوی ☰ اهلی

**حەمایەڵ / ĥemayeł/**: ناو. حەمایڵ؛ هەماڵ؛ همێلی؛ نووشتەی (زۆرتر بە منداڵەوە) هەڵواسراو ☰ دُعای نوشته

**حەمبارەپۆ / ĥembarepo/**: ناو. هەمارەپۆ؛ کووتاڵی ڕزیو لە هەماردا ☰ کالای داغی در انبار

**حەمباز / ĥembaz/**: ☜ **قەڵەمباز**

**حەمبەلی / ĥembelî/**: ناوەڵناو. *[کینایە]* حەنبەلی؛ ڕاڕایی؛ وازوازی؛ وەسواسی؛ بە بێ توانستی بڕیار دان و دڵنیا بوون ☰ وسواسی

**حەمتەر / ĥemter/**: ☜ **عەنتەر**

**حەمحەم[1] / ĥemĥem/**: ناو. جووجە؛ مێروویەکی سووری بچووکە بە کەسێکدا هەڵگەڕێ، شوێنەکەی لیر دەکا ☰ ساس

**حەمحەم[2]**: دەنگ. وشەی دنەدانی منال بۆ خواردن ☰ واژەی تشویق کودک به خوردن

**حەمد / ĥemd/**: ناو. ١. ئاگایی (بێ حەمدێ خۆ ئەڤ شوول کر) ٢. فاتیحە؛ سوورەتی هەوەڵی قورئان ٣. سپاس؛ پێزانین (حەمد و سەنا بۆ خوا، قەرزەکانم بار کرد) ☰ ١. عمد ٢. حمد ٣. سپاس

**حەمزک / ĥemzik/**: ناو. جۆرێ چێشتە ☰ نوعی غذا

**حەمزەل / ĥemzel/**: ناو. حەمزەلێن؛ حەنزەل؛ کەوشەک؛ گەمەیەکە، دەستەیەک دادەنەوێن و دەستەیەک بە سەر پشتیاندا باز دەدەن ☰ جُفتک‌چارکش

**حەمزەلێن / ĥemzełên/**: ☜ **حەمزەل**

**حەمشین / ĥemşîn/**: ناو. حەمەدەشین؛ حەمیشن؛ هەڵووژە قەیسی؛ شەلیل؛ بەری دارێکە لە پەیوەندی هەڵووچە و قەیسی ☰ شلیل

**حەمکە / ĥemke/**: ناوەلکار. هەمکە؛ ئەندازەیەکی زۆر ☰ زیاد

**حەمو[1] / ĥemû/**: ناوەڵناو. هەموو؛ حەمی؛ حەمێ؛ گش؛ گشت (حەموو خەڵکی؛ حەموو شت) ☰ همه

**حەمو[2]**: ناوەلکار. هەموو؛ حەمی؛ حەمێ؛ گشت؛ سەرپاک (قسەکانی حەموو فشەیە!) ☰ همه

**حەمو[3]**: جێناو. هەموو؛ حەمی؛ حەمێ؛ گشت (حەموو هاتبوون) ☰ همه

**حەمەدەشین / ĥemedeşîn/**: ☜ **حەمشین**

**حەمەرەمزێ / ĥemerem(i)zê/**: ناو. ١. ململانێ؛ ڕکبەرکێ؛ ڕقبەرقە؛ بەربەرەکانێ ٢. چەقە و هەرا ☰ ١. رقابت ٢. داد و قال

**حەمەگورگێ / ĥemegurgê/**: ناو. چاوشارەکێ؛ گوری ـ گوری ☰ قایم‌موشک‌بازی

**حەمی / ĥemî/**: ☜ **حەمو**

**حەمیسەن / ĥemîsen/**: ناو. ڕەگەزێکی بزن ☰ نژادی از بُز

**حەمیشن / ĥemîşin/**: ☜ **حەمشین**

**حەمێ / ĥemê/**: ☜ **حەمو**

**حەن / ĥen/**: ☜ **حاند**

**حەنا / ĥena/**: ☜ **حاند**

◙ **لەحەند** دەرهەقی (ئێوە لە حەنا یەکتر بۆ وانە؟) ☰ در حق

**حەنباڵ / ĥenbał/**: ☜ **حەماڵ**

**حەنبەڵ / ĥenbeł/**: ☜ **حەماڵ**

**حەنبەلی / ĥenbelî/**: ناوەڵناو. ١. ☜ **حەمبەلی** ٢. هەنبەلی؛ پەیڕەوی ئیمام ئەحمەدی حەنبەل ☰

١. ☜ **حەمبەڵی** ٢. حنبلی

**حەنتەر** / ĥenter/: ☜ **عەنتەر**

**حەنتیکە** / ĥentîke/: ☜ **ئەنتیکە**

**حەنتیکەخانە** / ĥentîkexane/: ☜ **ئەنتیکەخانە**

**حەنجۆر** / ĥencor/: ناو. زڕک؛ گەرمک ☰ خربزەی نارسیده

**حەنجەت** / ĥencet/: ناو. بیانوو؛ بەهانە؛ پەلـپ ☰ بهانه

**حەنجەڵ** / ĥencel/: ناو. ئەجەڵ؛ ئەنجەڵ؛ وەختی مردن ☰ اجل

**حەندرحۆ** / ĥendirĥo/: ☜ **حندرحۆ**

**حەندۆلی** / ĥenolî/: ناو. دۆدانە؛ دوانە؛ شیرمەشک ☰ مشک کوچک

**حەندوولە** / ĥendûle/: ناو. جۆرێ گەنم ☰ نوعی گندم

**حەندەف** / ĥendef/: ناو. حەدەف؛ تەپۆلکە؛ گردوولکە ☰ تپه

**حەنزەل** / ĥenzel/: ☜ **حەمزەل**

**حەنک** / ĥenik/: ناو. *[ئاشیرین]* حینچک؛ کوت ☰ عمل کله زدن

**حەنگرین** / ĥeng(i)rîn/: چاوگ. بە ڕقدا چوون؛ دە ڕکەوە چوون ☰ لج کردن

**حەنەزا** / ĥeneza/: ☜ **هەنەزا**

**حەنەفی**[1] / ĥenefî/: ناو. شێرەی ئاو ☰ شیر آب

**حەنەفی**[2]: ناوەڵناو. هەنەفی؛ پەیڕەوی مەزەبی ئیمام ئەبووحەنیفە ☰ حنفی

**حەنەق** / ĥeneq/: ☜ **حەنەك**

**حەنەک** / ĥenek/: ناو. حەنەق؛ حەلک؛ هەنەک؛ هەنک؛ جەفەنگ؛ قسەی گاڵتە و گەپ ☰ بذله

**حەنەکبێژ** / ĥenekbêj/: ☜ **حەنەکچی**

**حەنەکچی** / ĥenekçî/: ناوەڵناو. هەنەکچی؛ هەنەکچی؛ هەنەکی؛ حەنەکبێژ؛ حەلکی؛ گاڵتەچی؛ قسەسەیر؛ قسەخۆش ☰ بذله‌گو

**حەو**[1] / ĥew/: ☜ **حەوت**

**حەو**[2]: دەنگ. ١. وشەی سەیرمان ٢. وشەی بانگ کردنی پەز ☰ ١. عجب؛ کلمەی تعجب ٢. واژەی صدا زدن بُز

**حەو**[3]: دەنگەناو. وەڕەی سەگ ☰ پارس سگ

**حەوا** / ĥewa/: ناو. ١. هەوا؛ بلندایی دەوری زەمین ٢. هەوا؛ ئاسمان ٣. دایکەوا؛ لفی بابەدەم ☰ ١. جوّ زمین ٢. آسمان ٣. حوّا

⊡ **حەوا دان**: ١. فڕێ دان بەرەو ژوور ٢. بەرز کردنەوە ‹سەرت حەوا دە!› ☰ ١. پرتاب کردن به طرف بالا ٢. بلند کردن

**حەوابڕ** / ĥewabiř/: ناوەڵناو. وە حەوا کەوتوو ☰ مُعلّق در هوا

**حەواتیلکە** / ĥewatîlke/: ناو. کاری بەستنی پەت بە بەردێکی درێژۆکە و هەڵدانی بۆ حەوا ☰ عمل بستن نخ به سنگی باریک و پرتاب آن

**حەوار** / ĥewar/: ناو. حەواری؛ هاوار؛ گازی ☰ فریاد

**حەواری** / ĥewarî/: ☜ **حەوار**

**حەواق** / ĥewaq/: ☜ **حەویق**

**حەواڵە** / ĥewałe/: ناو. هەواڵە: ١. نووسراوەیەک کە تێیدا خوازراوە پارە یان شتێک بە هێنەری بدرێ ٢. ڕەوتی ناردن؛ پارە یان ماڵێک کە لە لایەن کەس یان دامەزراوەیەکەوە بۆ دیتری دەنێردرێت ٣. ڕەوتی خستن؛ ئەسپاردنی کارێک بە کەسێ، کاتێ یان شوێنێکیتر ٤. کاری سپاردن ☰ ١تا٣. حواله ٤. عمل سپُردن

⊡ **حەواڵە بە گەواڵە (پێ) کردن**: دەستی ـ دەستی کردن؛ ئەمڕۆ بە سبەی کردن ‹ئەو پیاوە داماوەیان لە مەزرینگەدا، لەم دیو بۆ ئەو دیو حەواڵە بە گەواڵە پێ دەکرد› ☰ امروز ـ فردا کردن

**حەوان** / ĥewan/: ☜ **حاوانەوە**

**حەوانچــە** / ĥewançe/: ناوەڵــناو. حەواویلکـــــە؛ فڕێدراو؛ هاوێژراو ☰ پرت شده

⊡ **حەوانچە دان**: بەرەو ژوور هاویشــتن ☰ بـە هــوا پرتاب کردن

**حەواندنەوە** / ĥewand(i)newe/: ☜ حاواندنەوە

**حەوانن** / ĥewanin/: چاوگ. ئاگــاداری کــردن و لای خۆ ڕاگرتن ☰ مُراقبت کردن

**حەواننەوە** / ĥewannewe/: ☜ حاواندنەوە

**حەوانەوە** / ĥewanewe/: چاوگ. ١. ئاسوودە ژیان ‹ڕێگەم بدەرێ با بچمە لایان/ بحەوێمــەوە لـە سـا و پــەنایان «قــانع»› ٢. جــێ بوونــەوە لــە شــوێنێک ‹ماوەی دە ساڵان ئـەم مـاڵ و ئـەو ماڵـمان کـرد تـا سەرەنجام لەم شوێنە حەواینــەوە› ☰ ١. آسـودن ٢. جای گرفتن

**حەواوی** / ĥewawî/: ناو. چاوحەوایی؛ چاوحەواوی؛ حــەوایی؛ دۆخــی چــاو هەڵــگەڕانەوە و ســپی بوونەوەی؛ خزانی گلێنەی چـاو و ون بـوونی لـە پشت سپێنەی چاودا ☰ کلاپیسە

**حەواویلکــە**[١] / ĥewawîlke/: نــاو. بــــادەوە؛ بەرزەحەوایلـە؛ تـەیارەی کاغـەزی ‹حەواویلکـەی حەوا ئەکا/ بە دەست و پێ سەما ئەکا «فولکلۆر»› ☰ هواپیمای کاغذی

**حەواویلکە**[٢]: ☜ حەوانچە

**حەوایی** / ĥewayî/: ☜ حەواوی

**حەوبرا** / ĥewb(i)ra/: ☜ حەوتەوانان

**حەوبرالە** / ĥewb(i)rale/: ☜ حەوتەوانان

**حەوت**[١] / ĥewt/: ناو. حەفت؛ حەو؛ هـۆت؛ هـۆوت؛ هەفت؛ هەوت؛ ژمارەی سەرەکی پێش لە هەشت و دوای شەش ☰ هفت

**حەوت**[٢]: ناوەڵناو. حــەفت؛ حــەو؛ هــۆت؛ هــۆوت؛ هەفت؛ هەوت؛ دانەیەک زۆرتر لە شەش دانــە ☰ هفت

**حەوتئاو** / ĥewt'aw/: ☜ حەفتاو

⊡ **حەوتئاو کردن**: خــاوێن کردنــەوەی گــلاو بــە حەوت جار شۆردن بە ئاو ☰ هفت آب کردن

**حەوتا** / ĥewta/: ☜ حەفتا

**حەوتانە** / ĥewtane/: ☜ حەفتانە

**حەوتبرالە** / ĥewtb(i)rale/: ☜ حەوتەوانان

**حەوتبەند** / ĥewtbend/: ناو. جۆرێ شیعر بـریتی لە چەند بەش، هەر بەشێ حـەو بـەیت ☰ نـوعی ترجیع‌بند

**حەوتتوێ** / ĥewtt(i)wê/: ☜ هەفتوێ

**حەوتخشــــــتەکی** / ĥewtxiştekî/: نــــــــاو. حەفتخشتەکی؛ پارچەهەڵبەستی حەو لـەت ☰ شعر هفت مصراعی

**حەوترینگە** / ĥewt(i)rînge/: نـاو. حەفتــەبیجاڕ؛ چێشتێکی کوردەوارییە، حەوت شتی تێ دەکرێ کە بـریتین لـە: شـەلەم، نـۆک، مێـوژ، گۆشـت، چۆنەر، بروێش و ڕۆن ☰ نوعی آش

**حەوتڕوو** / ĥewtřû/: ☜ حەیاچوو

**حەوتڕەنگیلە** / ĥewtřengîle/: ناو. کاسەڵەشینکە؛ پەلەورێکە ☰ سبزقبا

**حەوتزمانکە** / ĥewtz(i)manke/: نـاو. قژاوکــە ☰ زاغ جی‌جاق

**حــەوتگرێ** / ĥewtg(i)rê/: نـاو. گیایــەکی وردی جومگە ـ جومگەیە، زۆر بەرز نابێت ☰ گیاهی است

**حەوتگوڵ** / ĥewtguł/: نـاو. جۆرێ گەنم ☰ نـوعی گندم

**حەوتلۆ** / ĥewtlo/: ☜ هەفتلۆ

**حەوتم**[١] / ĥewtim/: نـاو. حەوتەم؛ حــەفتم؛ کـاری شیو بەخشین بە هـۆی حەفتــەی منـاڵ بـوون و حەفتەی مردوو ☰ اطعام روز هفتم

**حەوتم**[٢]: ناوەڵناو. حەوتەم؛ حەفتم؛ هەوتن؛ بە ڕیز، ڕزن، پلە یان جێگای حەوتەوە ‹جاری حەوتم› ☰ هفتم

**حەوتوانە** / ĥewtwane/: ☜ حەفتانە

**حەوتوێلکە** / ĥewtwêlke/: ناو. جۆرە کوانێکی بەژانە تا حەوت توێخ نەخا دەرکی نابێ 🇮🇷 نوعی دمُل

**حەوتو** / ĥewtû/: ناو. هەوتە: ۱. حەفتە ۲. حەو ڕۆژەی منداڵ بوون 🇮🇷 ۱. هفته ۲. هفتەی زایمان

**حەوتە**[1] / ĥewte/: ناو. حەفتە؛ حەوتوو 🇮🇷 هفته

**حەوتە**[2]: دەنگەناو. حەپەی سەگ 🇮🇷 پارس سگ

**حەوتەکێش** / ĥewtekêş/: ☜ حەفتەکێش

**حەوتەم** / ĥewtem/: ☜ حەوتم

**حەوتەمین** / ĥewtemîn/: ئاوەڵناو. حەفتەمین 🇮🇷 هفتمین

**حەوتەوانان** / ĥewtewanan/: ناو. حەفتبرالێ؛ حەفتەوانە؛ حەوتەوانان؛ حەوتەوانە؛ حەوتبرالە؛ حەوبرا؛ حەوبرالە؛ حەفتبرا؛ هەفتبرا؛ حەوت ئەستێرەی وەک پیتی «ک» (حەوتەوانان بوو میدالی شەری من/ چەندە شۆڕاوە بە خوێن شاپەڕی من «سوارە») 🇮🇷 صورت فلکی هفت برادران

**حەوتەوانە** / ĥewtewane/: ☜ حەوتەوانان

**حەوتیر** / ĥewtîr/: ناو. جۆرێ دەمانچە کە حەوت فیشەک دەخوا 🇮🇷 هفت تیر

**حەوج** / ĥewc/: ☜ حەوجێ

**حەوجۆش** / ĥewcoş/: ناو. حەفتجۆش؛ حەفجۆش؛ هەفتجووش؛ لوولینەی مەفرەق 🇮🇷 آفتابەی مفرغی

**حەوجۆشی** / ĥewcoşî/: ناو. جۆرێ کوولەکەیە لە کوولەکە سەراوی دەکا 🇮🇷 نوعی کدوتنبل

**حەوجۆک** / ĥewcok/: ئاوەڵناو. حەوجەدار؛ حەوجەک؛ موحتاج 🇮🇷 محتاج

**حەوجە** / ĥewce/: ☜ حەوجێ

**حەوجەدار** / ĥewcedar/: ☜ حەوجۆک

**حەوجەک** / ĥewcek/: ☜ حەوجۆک

**حەوجێ** / ĥewcê/: ناو. حەوج؛ حەوجە؛ ئەوجە؛ پێداویستی؛ پێویستی 🇮🇷 نیاز

**حەودەم** / ĥewdem/: ئاوەڵناو. *[پلار]* چەنەوەر و بێحەیا 🇮🇷 وراج و بی‌شرم

**حەورانەوە** / ĥewranewe/: چاوگ. پەنگ خواردنەوە و گەڕانەوە (تراو) 🇮🇷 جمع شدن و برگشتن (مایعات)

**حەوڕەنگیلە** / ĥewřengîle/: ناو. کاسەڵەشینکە؛ ڕەنگەڕێژە؛ حەفتڕەنگیلە؛ حەوتڕەنگیلە؛ مێشخۆرە 🇮🇷 سبزقبا

**حەوز** / ĥewz/: ناو. هۆوز؛ هەود؛ برک؛ جێئاو 🇮🇷 حوض

**حەوزانە** / ĥewzane/: ناو. پیتاکی میراو 🇮🇷 مُزد میراب

**حەوسەت** / ĥewset/: ☜ حەوسەد

**حەوسەد**[1] / ĥewsed/: ناو. حەفسەد؛ حەفسە؛ هەوتسەی؛ حەوسەت؛ ژمارەی سەرەکی پاش شەشسەد و نەوەد و نۆ، پێش حەوسەد و یەک 🇮🇷 هفتصد

**حەوسەد**[2]: ئاوەڵناو. حەفسەد؛ حەفسە؛ هەوتسەی؛ حەوسەت: ۱. یەکێک زۆرتر لە شەشسەد و نەوەد و نۆ ۲. حەوسەدەم 🇮🇷 ۱و۲. هفتصد

**حەوسەدەم** / ĥewsedem/: ئاوەڵناو. بە پلە و جێگای حەفسەدەوە 🇮🇷 هفتصدم

**حەوسەدەمی** / ĥewsedemî/: جێناو. ئەوەی لە ڕیز، پلە یان جێگای حەوسەدەمدایە 🇮🇷 هفتصدمی

**حەوسەدەمین** / ĥewsedemîn/: ئاوەڵناو. بە پلە و جێگای حەوسەدەمەوە 🇮🇷 هفتصدمین

**حەوسەلە** / ĥewsele/: ☜ حەوسەڵە

**حەوسەڵە** / ĥewseɫe/: ناو. حەوسەلە؛ تاقەت: ۱. تابشت؛ هێدکی؛ پشوو لەسەرخۆیی ۲. لەش؛ تاو؛ هاز؛ تەقا؛ تەیاری زەین بۆ ئەنجامدانی کارێ 🇮🇷 ۱و۲. حوصله

**حەوسین** / ĥewsîn/: ☜ حەفتسین

**حەوش** / ĥewş/: ☜ حەوشە

**حەوشە / ĥewşe/**: ناو. حەوش؛ هەوشە: ١. هەوش؛ هەسار؛ حەسار؛ لامەردوو؛ گۆڕایی ناو چواردیواری ماڵ ٢. جێ شوێنی ئاژەڵ ٣. ماڵ 🇮🇷 ١. حیاط ٢. حیاط مانندی برای نگهداری دام ٣. خانه

**حەوشەخەڵوەتی / ĥewşexełwetî/**: ناو. حەوشەی چکۆلەی پشت خانوو 🇮🇷 حیاطخلوت

**حەوشەمەڕ / ĥewşemeř/**: ☜ هەوێز[1]

**حەوق / ĥewq/**: ناو. ١. پلەپەیژە؛ پلەی نەردیوان ٢. گیر و گرفتی بێ دەرەتان 🇮🇷 ١. پلەی نردبام ٢. گرفتاری

⊡ **حەوق بوون**: حاوقان؛ تووش بوون 🇮🇷 گرفتار شدن

**حەول / ĥewl/**: ناو. حەوڵ؛ هەوڵ؛ تەقالا؛ کۆشش 🇮🇷 کوشش

⊡ **حەول دان**: حەوڵ دان؛ تەقالا کردن ‹بۆ دووکانی موشتەری گەر حەول ئەدا کالافرۆش/ دینی وا دێنێتە قیمەت خواجە ئەعزایی بکا «مەحوی»› 🇮🇷 کوشیدن

**حەول و حەوش / ĥewl û ĥewş/**: ناو. دەور و بەر 🇮🇷 حول و حوش

**حەول و دەول / ĥewl û dewl/**: ناو. هەوڵ و تێکۆشان ‹لە حەول و دەولی ئەوەدا بووم کارێکی بۆ بدۆزمەوە› 🇮🇷 تلاش و کوشش

**حەولە / ĥewle/**: ناو. هەولە؛ خاولی؛ مەرحەمە 🇮🇷 حولە

**حەوڵ / ĥewł/**: ☜ حەول

⊡ **حەوڵ دان**: ☜ حەول دان

**حەونای / ĥewnay/**: چاوگ. حەپین؛ وەڕین 🇮🇷 پارس کردن

**حەویان / ĥewyan/**: ☜ حاوانەوە

**حەوینج / ĥewînc/**: ناو. شەمبەلیلک 🇮🇷 شنبلیلە

**حەوینەوە / ĥewînewe/**: ☜ حاوانەوە

**حەوێق / ĥewêq/**: ناو. هەوێق؛ حەواق؛ بەرزایی؛ جێی بەرز ‹خوێنەر دەبەنە حەوێقی ئاسمان و دەیهێننە خوارێ› 🇮🇷 بلندی

**ـ حەوێن / ĥewên-/**: پاشەوشە. ـ حاوێن؛ ـ حەسێن؛ حەوێنەر؛ پەنادەر و هەدادەر ‹ماندووحەوێن› 🇮🇷 ـ آسا

**حەوێنج / ĥewênc/**: ناو. تۆوێکی وردە بە نانییەوە دەکەن 🇮🇷 خشخاش نان

**حەوێنجی / ĥewêncî/**: ناو. *[کنایە]* هێلکە گون 🇮🇷 بیضە

**حەوێنەر / ĥewêner/**: ☜ حاوێنەر

**حەی / ĥey/**: دەنگ. ١. وشەی سەیرمان ٢. وشەی تایبەتی حاڵ لێهاتنی دەروێشان 🇮🇷 ١. کلمەی تعجب ٢. حَی؛ تکیەکلام دراویش

**حەیا[1] / ĥeya/**: ناو. هەیا؛ شەرم؛ فەدی؛ فهێت ‹بێحەیایی باوە ئەمڕۆ، قوڕ بە سەردا کا حەیا/ کەندەڵان سەربەرز و شادە، خۆی بشارێتۆ چیا! «قانع»› 🇮🇷 حیا

⊡ **حەیا تکان**: ☜ حەیا چوون

**حەیا چوون**: حەیا تکان؛ ئابڕوو چوون 🇮🇷 رسوا شدن

**حەیا[2]**: ئامراز. هەتا؛ تاکوو ‹حەیا کەنگێ ئەم وا بن/ بندەستێ دوژمنا بن «جگەرخوون»› 🇮🇷 تا

**حەیابەخۆ / ĥeyabexo/**: ئاوەڵناو. بەحەیا؛ شەرمین 🇮🇷 باادب

**حەیات[1] / ĥeyat/**: ناو. ژیان: ١. زندەگی (ژیان و مەرگ) ٢. ماوەی ژین ‹وەر نە تا حەیات عاریەت مەندەن/ ئەجەڵ بنچینەی نەسیب نەکەندەن «مەولەوی»› 🇮🇷 ١و٢. حیات

⊡ **حەیات لێ برین**: کوشتن 🇮🇷 کشتن

**حەیات[2]**: ئاوەڵناو. خۆش؛ دڵگر ‹سلێمانی شارە حەیاتەکەی کوردستان!› 🇮🇷 دل‌انگیز

**حەیاتکاو / ĥeyat(i)kaw/**: ☜ حەیاچوو

**حەیاچوو / ĥeyaçû/**: ئاوەڵناو. حەیاتکاو؛

حەیاچووگ؛ حەوتڕوو؛ ئابڕوونەماو 🇮🇷 رسوا

**حەیاچووگ** / ĥeyaçûg/: ☜ **حەیاچوو**

**حەیادار** / ĥeyadar/: ئاوەڵناو. شەرمین 🇮🇷 باادب

**حەیار** / ĥeyar/: ئاوەڵناو. فێڵباز؛ مەکرباز 🇮🇷 حیلەگر

**حەیارە** / ĥeyare/: ☜ **عەیارە**

**حەیاز** / ĥeyaz/: ناو. حەیاس؛ چقە؛ پاژنەی کەڵەباب 🇮🇷 پاشنەی پای خروس

**حەیاس** / ĥeyas/: ☜ **حەیاز**

**حەیبەت** / ĥeybet/: ناو. سام؛ ترس؛ مەترسی؛ عەیبەت؛ عەیبەتان 🇮🇷 هیبت

**حەیتاندن** / ĥeytandin/: چاوگ. گوڕڕە کردن؛ هەو ـ هەو کردنی سواران 🇮🇷 هورا کشیدن سواران

**حەیتە** / ĥeyte/: ناو. ١. چەتیو؛ کچەتیو ٢. *[کینایە]* سیرەت؛ چووک؛ کیر ‹هەستایە پێ حەیتەی زەلام، لەو مەقسەدەی کردی سەلام/ تێکەڵ بە یەکتر بوون تەمام، وەک خەنجەر و کالانی زەڕ! «قانع»› 🇮🇷 ١. نوعی ناسزا ٢. آلت مرد

**حەیچە** / ĥeyçe/: ناو. هاوار و داد 🇮🇷 فریاد

**حەی ـ حەی** / ĥey ĥey/: دەنگ. وشەی سەیرمان 🇮🇷 عجب؛ کلمەی تعجب

**حەیرا** / ĥeyra/: جێناو. کاورا؛ فلان 🇮🇷 فلانی

**حەیران**[1] / ĥeyran/: ناو. هەوای گۆرانییەکی کوردی 🇮🇷 از آوازهای باستانی کردی

**حەیران**[2]: ئاوەڵناو. ١. عاشق؛ ئەویندار؛ بەندەوار ‹وەتەن! قوربانی شیرین‌جیلوەکەی وەختی بەهارت بم/ وەتەن! حەیرانی سونعی دڵڕفێنی کردگارت بم «جەمیل زیانەددینی»› ٢. سەرلێشێواو ‹وەرە ئەم نیکتەیە من پێت بڵێم نالی ئەگەر فەرزەن/ هەموو دنیات ببێ، هێشتاکوو هەر حەیران و داماوی «نالی»› 🇮🇷 ١. عاشق ٢. حیران

**حەیز** / ĥeyz/: ناو. سووڕی مانگانە؛ مەهک؛ بێنوێژی ژن 🇮🇷 حیض

**حەیزەران** / ĥeyzeran/: ☜ **خەیزەران**

**حەیزە** / ĥeyze/: ناو. ١. هێڵنج و ڕشانەوە ٢. دۆخی زگ چوون ٣. نەخۆشی ئیسقایی. هەروەها: **حەیزە بوون** 🇮🇷 ١. تهوع ٢. اسهال ٣. استسقا

**حەیس و بەیس** / ĥeys û beys/: ناو. شەڕەقسە؛ کار و ڕەوتی لە سەر قسە ڕۆشتن ‹ئەو حەیس و بەیسەی ناوێ، هەردووک خەتاکارن› 🇮🇷 بحث و جدل

**حەیشۆ** / ĥeyşo/: ناو. ١. شەرم و شوورەیی ٢. *[پلار]* بێشەرمی؛ بێئابڕوویی 🇮🇷 ١. شرم و حیا ٢. بی‌شرمی

**حەیشە** / ĥeyşe/: ناو. حەیچە؛ داد و هاوار 🇮🇷 فریاد

**حەیف**[1] / ĥeyf/: ناو. ١. مخابن؛ داخ؛ ئاخ؛ وشەی پەشێوی کە لە کاتی لە دەس‌دانی کەسێ یا شتێ یان لە نەبوون و کەمایەسییەکدا بە کار دەڕوا ‹حەیفم لە دڵێ دێ کە بەبێ سووتمانە/ دڵداری تیا نەکردووە هێلانە «هەژار، *خەییام*»› ٢. تۆڵ؛ تۆڵە 🇮🇷 ١. افسوس ٢. انتقام

⊡ **حەیف ستاندن:** تۆڵە کردنەوە 🇮🇷 انتقام گرفتن

**حەیف**[2]: دەنگ. وشەی خەمباری 🇮🇷 حیف

⊡ **حەیف بوون:** جێ داخ بوون ‹پاش مەرگی بابم زۆری پێ ناخۆش بوو کە ناچارم دەست لە خوێندن بەردەم، دەیگوت زۆر حەیفە تۆ نەخوێنی «هەژار، *چێشتی مجێور*»› 🇮🇷 حیف بودن

**حەیف لێ هاتن:** داخ لێ هاتن 🇮🇷 حیف آمدن

**حەیفی** / ĥeyfî/: ☜ **حەیفێ**

**حەیفێ** / ĥeyfê/: سارستە. حەیفی؛ بە داخەوە 🇮🇷 افسوس

**حەیلانکێ** / ĥeylankê/: ناو. جۆلانێ 🇮🇷 تاب

**حەین** / ĥeyn/: ئامراز. عەین؛ هەر وەک؛ تەواو لە وێنەی 🇮🇷 مانند؛ عین

**حەیوان** / ĥeywan/: ناو. ١. ئاژەڵ ٢. جانەوەر ٣. *[پلار]* کەر و نەفام 🇮🇷 ١. دام ٢. حیوان؛ جانور ٣. نفهم

**حەیوانی** / ĥeywanî/: ئاوەڵناو. ١. پێوەندیدار یان سەر بە زیندەوەرەوە ‹ڕۆنی حەیوانی› ٢. وەکوو

حەیوان ‹ژیانی حەیوانی› ﷼ ١و٢. حیوانی

**حەیوە / ĥeywe/**: ناو. بەهێ؛ بەی؛ بێ ﷼ میوەی به

**حەیهو / ĥeyhû/**: ☜ هەیهو

**حەییە / ĥeyye/**: ☜ عیدده

**حیت / ĥît/**: ناو. جۆرێ بزن ﷼ نوعی بُز

**حیچ / ĥîç/**: ☜ هیچ

**حیچیە / ĥîç(i)ye/**: ☜ حیچێك

**حیچێ / ĥîçê/**: ☜ حیچێك

**حیچێک / ĥîçêk/**: جێناو. حیچێ؛ حیچیە؛ شتێک ‹زۆریان لێ‌پرسیم، حیچێکم نەزانی› ﷼ هیچی

**حیز[1] / ĥîz/**: ناو. [ناشیرین] ژنی خراپکار ﷼ زن بدکاره

**حیز[2]**: ناوەڵناو. [ناشیرین] ١. داوێن‌پیس (بۆ ژن) ٢. ژنباز؛ چاوباز (بۆ پیاو) ٣. [پلار] ترسنۆک؛ کەلەزات ‹حیز و سلامەت «مەسەل»› ٤. [مەجازی] سست و تەمەڵ ‹تازییەکە حیز بووە، کەروێشک ناگرێ› ﷼ ١. تردامن (زن) ٢. تردامن (مرد) ٣. ترسو ٤. تنبل

**ـ حیز[3]**: پێشوشە. [ناشیرین] پەنامەکی و دزێو ‹حیزبگیر؛ حیزهەڵمەت› ﷼ زیرزیرکی

**حیزاتی / ĥîzatî/**: ناو. [ناشیرین] ترسەنۆکی؛ ترسوونەکی ﷼ بُزدلی

**حیزانە[1] / ĥîzane/**: ناوەڵناو. [ناشیرین] ترسەنۆکانە ‹شەڕی حیزانە› ﷼ بُزدلانه

**حیزانە[2]**: ناوەڵکار. [ناشیرین] ترسەنۆکانە ‹نەتبیستووە، واتەی زانای سەرزەمین/ مەردانە مردن نەک حیزانە ژین «هەژار، بۆ کوردستان»› ﷼ بُزدلانه

**حیزاوحیز / ĥîzawĥîz/**: ناو. [پلار] ترسەنۆک و ترسەنۆک لە ڕاست یەکتر ﷼ دو ترسو مقابل هم

**حیزایەتی / ĥîzayetî/**: ناو. [ناشیرین] حیزاتی؛ حیزییەتی؛ حیزێتی ﷼ بُزدلی

**حیزب / ĥîzb/**: ناو. پارت ﷼ حزب

**حیزبگیر / ĥîzb(i)gîr/**: ناو. [پلار] کاری نامەردانە بە یەخسیر گرتنی کەسێک ﷼ عمل ناجوانمردانه کسی را اسیر گرفتن

**حیزفرسەت / ĥîzfirset/**: ناوەڵناو. [پلار] هەلپەرست؛ هەلخواز ﷼ فرصت‌طلب

**حیزنای / ĥîznay/**: چاوگ. ١. بەزاندن ٢. ترساندن ﷼ ١. شکست دادن ٢. ترساندن

**حیزوسلامەت / ĥîz û s(i)łamet/**: ناوەڵناو. [پلار] خۆپاریز لە خەتەر، لە ترسان یان بۆ بەرژەوەندی ﷼ محافظه‌کار

**حیزەبخۆیی / ĥîzeb(i)xoyî/**: ناو. [ناشیرین] ژیانی خوێڕییانە و سەربار بوون ‹لە بەر حیزەبخۆیی و ناتەبایی/ لە ژێری حیزی حیزان بووینە دۆشەک! «حاجی قادر»› ﷼ زندگی خفّت‌بار

**حیزەفێڵ / ĥîzefêł/**: ناو. [ناشیرین] فێڵ و گزی ترسەنۆکانە و خوێڕییانە ﷼ حیله‌ی بُزدلانه

**حیزەڵ / ĥîzeł/**: ناوەڵناو. [پلار] حیزەڵە؛ ترسەنۆک ﷼ بُزدل

**حیزەڵمەت / ĥîzełmet/**: ناو. [ناشیرین] حیزهەڵمەت؛ هەڵمەتی ناتەواو و وێڕای ترس ﷼ حمله‌ی ناتمام و همراه با ترس

**حیزەڵە / ĥîzełe/**: ☜ حیزەڵ

**حیزهەڵمەت / ĥîzhełmet/**: ☜ حیزەڵمەت

**حیزی / ĥîzî/**: ناو. [ناشیرین] نامەردی؛ شێوەی نامەردی ڕەچاو کردن ﷼ نامردی

**حیزییەتی / ĥîzîyetî/**: ☜ حیزایەتی

**حیزێتی / ĥîzêtî/**: ☜ حیزایەتی

**حیس / ĥîs/**: ☜ حەس[1]

**حیساب / ĥîsab/**: ناو. حەساب؛ حەساو؛ حەسێب؛ حیساو؛ هەساو؛ هەسێب؛ هەسوو: ١. لقێ لە زانستی بیرکاری ٢. سیاهە؛ ڕیزی قەرز و فەرزی کەس یان ڕێخراوەیەک لەگەڵ کەس یان ڕێخراوەیەکی‌تردا ‹حیسابتان زۆر چۆتە سەر، هێندێک پارەمان بدەنێ!› ٣. قەرز یان بستێنکاری ‹بۆچی حیسابی ئێمە نادەی؟› ٤. سیاهەی

دارایی، سەودا، قەرزداری یان قەرزدەری کەس یان ڕێخراوەیەک ٥. نرخی کالا یان ڕاژەی سەوداکراو ‹حیسابمان بوو بە چەند؟› ٦. ژمار؛ ژمارە؛ ئەژمار؛ هەژمار ‹حیسابی گولەکانی تیمی سەرکەوتوو› ۷. ڕەوت؛ دۆزەنە؛ ڕێکوپێکی و گەڕانی کار ‹هۆشت بێ حیسابی کار لە دەستت دەرنەچێ!› ۸. بڕیارنامە یان پێکهاتی نێوان کەسانێک بۆ سەودا کردن و داوسانی پارە یان کالا ‹حیسابی بانکی؛ حیسابی پاشکەفت› ۹. هۆکار؛ هۆ؛ سەبەب ‹لە سەر چ حیسابێک ئەم قسە دەکەی؟› ۱۰. کاری ژماردن یان پێدا گەیشتن بە ژمارە یان چۆنیەتی شتێک ‹میوانەکان حیساب کە بزانە چەن کەسن› ۱۱. کاری زانین؛ دانان؛ گرنگی پێ دان، بایەخ پێ دان یان بە شتێ دانان ‹هەر بە بنیادەمی حیساب ناکەن› ☰ ۱تا۱۱. حساب

◙ **حیسابی ئەبجەد**: حەسێبی ئەبجەد؛ حەساوی ئەبجەد

| | | |
|---|---|---|
| الف =۱ | ک =۲۰ | ر =۲۰۰ |
| ب =۲ | ل =۳۰ | ش =۳۰۰ |
| ج =۳ | م =۴۰ | ت =۴۰۰ |
| د =۴ | ن =۵۰ | ث =۵۰۰ |
| هـ =۵ | س =۶۰ | خ =۶۰۰ |
| و =۶ | ع =۷۰ | ذ =۷۰۰ |
| ز =۷ | ف =۸۰ | ض =۸۰۰ |
| ح =۸ | ص =۹۰ | ظ =۹۰۰ |
| ط =۹ | ق =۱۰۰ | غ =۱۰۰۰ |
| ی =۱۰ | | |

**حیسابی بانکی**: حەساوی بانکی؛ حەسێبی بانقی؛ جۆرێ بڕیارنامەی نێوان کەس یان دامەزراوەیەک لەگەڵ بانکدا بۆ پارازتنی پارەکەی لە بانک و وەرگرتنەوەی لە هەر کاتێکی پێویست یان لە پاش ماوەیەکی دیاریکراودا ☰ حساب بانکی

**حیسابدار** / ĥîsabdar/: ناو. ژماریار ☰ حسابدار

**حیسابزان** / ĥîsabzan/: ئاوەڵناو. ۱. زانا لە ژماردندا ۲. لێزان و کارلێکدەر ☰ ۱. حسابدان ۲. کاردان

**حیسابکەرە** / ĥîsabkere/: ناو. کەڵەکەترە ☰ چکچک کوهی

**حیسابگەر** / ĥîsabger/: ناو. ۱. لە ژمارەدا وریا ۲. حەساوگەر؛ فالگر ۳. ئەستێرەناس ☰ ۱. حسابگر ۲. فالگیر ۳. مُنجّم

**حیسابگەری** / ĥîsabgerî/: ناو. ۱. ئەستێرەناسی ۲. کاری فاڵ گرتنەوە بە تەزبێح ☰ ۱. مُنجّمی ۲. فال تسبیح

**حیسابناڕاست** / ĥîsabnařast/: ناو. سەرچەوت؛ ناحەساو ☰ بدحساب

**حیسابی**[۱] / ĥîsabî/: ئاوەڵناو. حەساوی: ۱. پڕبەپڕ؛ پەڕبەپەڕ؛ خاوەن بارودۆخ یان تایبەتمەندییەکی لەبار و شیاو ‹کاروباری حیسابی› ۲. پێوەندیدار بە حیسابەوە ☰ ۱و۲. حسابی

**حیسابی**[۲]: ئاوەڵکار. حەساوی؛ باش؛ بە تەواوی؛ بێ کەموکووڕی ‹حیسابی بۆم شی کردەوە› ☰ حسابی

**حیساو** / ĥîsaw/: ☜ **حیساب**

**حیش** / ĥîş/: ناو. سوورم؛ زەویینی گڵەسوورە ☰ زمین گِل سُرخ

**حیشتر** / ĥîştir/: ناو. وشتر؛ حوشتر ☰ شتر

**حیشی** / ĥîşî/: ناو. گوریسی پان و درێژ ☰ طناب پهن و دراز

**حیکایەت** / ĥîkayet/: ناو. چیرۆک: ۱. داستان ‹حیکایەتی مام ڕێوی› ۲. سەرگوروشتە ‹خاڵۆ دەرد دل بێ نیهایەتەن/ شیکایەت نییەن یە حیکایەتەن «مەولەوی»› ☰ ۱. حکایت ۲. سرگذشت

**حیکمەت** / ĥîkmet/: ناو. هکمەت؛ ژیری ☰ حکمت

**حیلاندن** / ĥîlandin/: چاوگ. تێنەپەڕ. //حیلاندت؛ دەحیلێنی؛ بحیلێنە// هیلاندن؛ حیلاندن؛ حیلە کردن؛ گۆڕاندن؛ هیرین ☰ شیهه کشیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەحیلاندن

**حیلکاندن / ĥîlkandin/:** ☜ **حیلاندن**

**حیلکانـــەوە / ĥîlkanewe/:** چـــاوگ. تێنەپـــەڕ. //حیلکایەوە؛ دەحیلکێیەوە؛ بحیلکێوە// *[پلار]* قا ـ قا پێکەنین؛ خەنین بە دەنگی بەرز ‹حیلکانـەوە لـەو موژدە ئاودڕ و خڕ/ ڕەش بوونەوە، ڕیشی سپی چیـای چڕ «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ قاه ـ قاه خندیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: حیلکاوەوە/ چاوگی نـەرێنی: نەحیلکانەوە

**حیلـکوهۆڕ / ĥîlk û hoř/:** دەنگـــەناو. *[پـــلار]* حیلکەهۆڕ؛ هیلکوهۆڕ؛ خەنینی زۆر و بە دەنگی بەرز ☰ قهقهه

**حیلکـە / ĥîlke/:** دەنگەناو. *[پلار]* هیلکـە؛ دەنگـی خەنین؛ کەن بە دەنگی بەقەو ☰ قاه ـ قاه خنده

**حیلکـــەحیلک / ĥîlkeĥîlk/:** دەنگـــەناو. *[پـــلار]* هیلکەهیلک؛ هیلەهیلک؛ حیلکەی زۆر ☰ قهقهه

**حیلکەهۆڕ / ĥîlkehoř/:** ☜ **حیلکوهۆڕ**

**حیلنای / ĥîlnay/:** چاوگ. هیرین ☰ شیهه کشیدن

**حیلە / ĥîle/:** نـاو. هیلە: ۱. دەنگـی ئەسـپ؛ کـۆڕژن ‹حیلەی کەحێلان› ۲. گزی؛ فێڵ ☰ ۱. شیهه ۲. حیله

**حیلەباز / ĥîlebaz/:** ئاوەڵـناو. حیلەسـاز؛ هیلـەباز؛ گزیکەر؛ فێڵاوی ☰ حیله‌گر

**حیلەحیل / ĥîleĥîl/:** دەنگەناو. هیلەهیل ☰ شیهه‌ی پیاپی اسب

**حیلەساز / ĥîlesaz/:** ☜ **حیلەباز**

**حیلەمار / ĥîlemar/:** ناو. کولەکۆرە ☰ افعی

**حیلەوحەواڵـە / ĥîle w ĥewałe/:** نـاو. فـێڵ و تەڵەکە؛ شندیمندی؛ فاکوفیک؛ فـەنوفـێڵ ☰ مکر و فریب

**حینـاوە / ĥînawe/:** نـاو. چەنـــەبازی؛ وڕاجـــی؛ چەنەچەن ☰ وراجی

**حینجە / ĥînce/:** ☜ **حونجی**

**حینجەت / ĥîncet/:** ناو. بەهانە؛ پەڵپ ☰ بهانه

**حینچک / ĥînçik/:** ناو. حینچکە؛ کوت؛ ژەنین ☰ کله

▣ **حینچک دان:** کـوت لێـدان؛ کـوت پێـوەدان؛ لێژەنین ☰ کله زدن

**حینچکە / ĥînç(i)ke/:** ☜ **حینچك**

**حیندرحۆ / ĥîndirĥo/:** ☜ **حندرحۆ**

**حینە / ĥîne/:** ناو. حیلە؛ دەنگی ئەسپ ☰ شیهه

**حێ / ĥê/:** نـاو. نێوی هەشتەمین پیتی ئەلفوبێـی زمانی کوردی ☰ نام هشتمین حرف از الفبای کردی

**حێچ / ĥêç/:** ناو. یەکسمی سەرکێش ☰ ستور سرکش

**حێدز / ĥêdiz/:** ئاوەڵناو. ۱. توورە ۲. وەڕەز؛ عـاجز ☰ ۱. خشمگین ۲. ناراحت

**حێز / ĥêz/:** ناو. هێز؛ وزە؛ توان ☰ توان

**حێزەرقانە/ ĥêzerqane/:** ناو. حیندرحۆ ☰ الاکلنگ

**حێشتر / ĥêştir/:** ☜ **حوشتر**

**حێق / ĥêq/:** ناو. هێڵنج ☰ عُق

**حێک / ĥêk/:** ناو. جۆلا ☰ جولا

**حێل / ĥêl/:** نـاو. ۱. هێز؛ قەوەت؛ تاقەت ۲. هێـل؛ حل؛ دەنکێکی بۆنخۆشە لە چـای و مـەرەبا و ... دەکرێ ☰ ۱. توان ۲. هِل

**حێلانــێ / ĥêlanê/:** نــاو. حێلانــــێ؛ جـــۆرێ هەڵپەڕکێی کچۆلانە ☰ نوعی رقص دختربچه‌ها

**حێلانێ / ĥêllanê/:** ☜ **حێلانێ**

**حێلم / ĥêlim/:** نـاو. ۱. برەی مافوور ۲. پۆی تەون ۳. هێلم؛ چەسپی دارتاشی ☰ ۱. اضافه نـخ قـالی که می‌بُرند ۲. پود ۳. چسب نجاری

**حێلەزووک / ĥêlezûk/:** ناو. حەقلیمەقۆ ☰ الاکلنگ

**حێول / ĥêwil/:** ئاوەڵـناو. حۆل؛ گێژ؛ کێل ☰ گـیج؛ ابله

**حێـوەت / ĥêwet/:** نـاو. سـام؛ تـرس؛ هەیبـەت ☰ هیبت

▣ **لە حێوەت** لە سامی ☰ از ترس

**حێـوەکی / ĥêwekî/:** نـاو. جـــۆرێ هەڵـــپەڕکێی کچۆلان ☰ نوعی رقص دختربچه‌ها

# خ

**خ** / x/: پیت. پیتی نۆهەمینی ئەلفوبێتکەی زمانی کوردی 🇮🇷 خ

**خ** / xi/: ناو. ناوی پیتی نۆهەمینی ئەلفوبێتکەی زمانی کوردی 🇮🇷 خ؛ نهمین حرف الفبای زبان کُردی

**خا** / xa/: ناو. ۱. هێلکە؛ هیلکە؛ هێک ۲. گون؛ هێلکەگون ۳. */سووکەڵە/* خاتوو؛ وشەی ڕێز نان بۆ ژن ‹خا فاتم› 🇮🇷 ۱. تخم پرنده ۲. خایه ۳. خانم

**خائین** / xa'în/: ☜ **خاین**

**خابان** / xaban/: ناو. گڵەبان؛ ئاخەبان؛ بانەناو 🇮🇷 گِل اندود بام

**خاپ** / xap/: ناو. گزی؛ فێڵ؛ حیله 🇮🇷 نیرنگ

**خاپان**[1] / xapan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //خاپای؛ دەخاپێی؛ بخاپێ// خاپیان؛ خاپین؛ خلافان؛ هەڵفریوان؛ هەڵخەڵەتان؛ گۆڵ خواردن؛ بە فریو چوون 🇮🇷 فریب خوردن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: خاپاو/ چاوگی نەرێنی: نەخاپان

**خاپان**[2]: ناو. فریو 🇮🇷 فریب

**خاپاندن** / xapandin/: چاوگ. تێپەڕ. //خاپاندت؛ دەخاپێنی؛ بخاپێنە// فریو دان؛ خەڵەتاندن؛ هەڵفریواندن؛ هەڵخلەتاندن؛ گۆڵ دان؛ تەفرەدان 🇮🇷 فریب دادن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەخاپاندن

**خاپاندی** / xapandî/: ناوەڵناو. فریودراو؛ خەڵەتاو 🇮🇷 فریب‌خورده

**خاپتانێ** / xaptanê/: ناو. خاپۆرە؛ کاری گاڵتە بە خۆڵ کردنی منالان 🇮🇷 خاکبازی (بچه‌ها)

**خاپخاپۆک** / xapxapok/: ناو. شوانخەڵەتێنە؛ شڤانکوژ؛ مەلێکی بۆری لە پاساری گەورەترە 🇮🇷 شبان‌فریبک

**خاپک** / xapik/: ناو. هەوسار؛ جڵەو 🇮🇷 افسار

**خاپوڕیپ** / xap û řîp/: ناو. فێڵ و گزی 🇮🇷 حیله و فریب

**خاپۆرە** / xapore/: ☜ **خاپتانێ**

**خاپوور** / xapûr/: ناوەڵناو. خارخاپوور؛ وێران ‹خەیلێن گەرد پات نە دیدەم دوور بێ/ یانەی چەم وێران تەمام خاپوور بێ «مەولەوی»›. هەروەها: **خاپوور بوون؛ خاپوور کردن** 🇮🇷 ویران

**خاپووروڵات** / xapûrew(i)łat/: ناو. وڵاتی وێرانبووی کەسی تێدا نەماو 🇮🇷 منطقه‌ی مخروبه‌ی خالی از سکنه

**خاپووری** / xapûrî/: ناو. وێرانی؛ کاولی 🇮🇷 ویرانی

**خاپەرۆک** / xaperok/: ناو. ۱. کاری دەغڵ بە با کردن کە لە خۆڵ پاک بێتەوە ۲. پاشەرۆکی ڕەز و بێستان 🇮🇷 ۱. عمل باد دادن غلّه ۲. پساچین

**خاپیان** / xap(i)yan/: ☜ **خاپان**

**خاپین** / xapîn/: ☜ **خاپان**

**خاپینۆک** / xapînok/: ئاوەڵناو. ١. دەسبڕ؛ فێڵباز؛ بەفریو ٢. گەوج؛ گەمژە ▬ ١. فریبکار ٢. ابله

**-خاپێن** / xapên-/: پاشەوشە. فریودەر؛ هەڵخەڵەتێن؛ خاوەن لێهاتوویی خاپاندن ▬ ـ فریب

**خات** / xat/: ناو. *[سووکەڵە]* خاتوو؛ خاتێ؛ خاد؛ وشەی ڕێز بۆ ژنان ‹خات مینا› ▬ عنوانی احترام‌آمیز برای زنان

**خاتر** / xatir/: ناو. بیر؛ ویر: ١. هەستی دڵ و دەروون ‹خاترێکی شۆخ و خۆش و بێ‌غەم و جەمعم هەبوو/ ئێستە بۆ زولفی کەسێ مەشقی پەرێشانی دەکا «نالی»› ٢. یاد؛ هۆش؛ فکر ‹بۆ زەڕڕەی نە عیشق مەجنوون بکەر مەیل/ باوەر بە خاتر وەفاداری لەیل «فەقێ قادر»› ▬ ١و٢. خاطر

▣ **بۆ/ بە خاتری کەسێ/ شتێ**: لە بەر شتێ یان کەسێ ‹بیکە بە خاتر سی جزمەی قورئان/ لەمە زیاتر مەمکە سەرگەردان «فولکلۆر»› ▬ بە خاطر کسی/ چیزی

▣ **خاتر گرتن**: ڕێز لێنان؛ حورمەت گرتن ▬ احترام گذاشتن

**خاتر گەرد گرتن**: زیز بوون؛ ڕەنجان ▬ رنجیدن

**خاتر لێ کردن**: تکا لێ‌کردن ▬ خواهش کردن

**خاترانە** / xat(i)rane/: ناو. بڕی داشکێنراو لە نرخی پیتەوا یا سزای تاوانبار بە مەبەستی ڕێز لێ‌گرتن ▬ تخفیف ویژه

**خاترجەم** / xatircem/: ئاوەڵناو. دڵئاسوودە؛ ئارخەیان ▬ خاطرجمع

**خاترجەمی** / xatircemî/: ناو. دڵنیایی؛ متمانە؛ هەداری ▬ خاطرجمعی

**خاترخازی** / xatirxazî/: ☜ **خاترخوازی**

**خاترخوا** / xatirx(i)wa/: ئاوەڵناو. عاشق؛ ئەویندار ▬ خاطرخواه

**خاترخوازی** / xatirx(i)wazî/: ناو. خاترخازی؛ مالاوایی؛ خواحافیزی ▬ خداحافظی

**خاترخۆیی** / xatirxoyî/: ناو. ١. سەرپشکی؛ یەکەم هەڵبژاردن ٢. کاری بەرچاو گرتن لە بەر دۆستایەتی ▬ ١. اوّلین انتخاب ٢. مُراعات

**خاتردار** / xatirdar/: ئاوەڵناو. بەڕێز ▬ مُحترم

**خاترداری** / xatirdarî/: ناو. کاری بە دڵ پێڕاگەیشتن؛ بە حەز ڕێز گرتن ‹نازکێش چوون ناز جە حەد بەرشییەن/ خاترداریش کەر وێنەی کەس نییەن «مەولەوی»› ▬ عمل خاطر گرفتن

**خاترناس** / xatirnas/: ئاوەڵناو. قەدرگر؛ ڕێزگر ▬ احترام‌گذار

**خاتروخۆتر** / xatir û xotir/: ناو. کەین‌وبەین؛ کاری لاگیری کردن لە یەکتر ▬ حمایت متقابل

**خاترێوە** / xat(i)rêwe/: دۆعا. مالاوا؛ مالاڤا؛ بەدۆعا؛ خوداحافیز ▬ بدرود

**خاتو** / xatû/: ☜ **خاتون**

**خاتوزمهەریر** / xatûzimherîr/: ناو. *[فەرهەنگی خەڵکی]* خاتووزمهەڕ؛ پیرژنی ئەفسانەیی کە دەڵێن خوشکی چلەگەورە و چلەچکۆلەیە و دوای نەمانی چلەکان شین دەگێڕێ و بەفر و باران دەبارێنێ ▬ زمهریر

**خاتوزمهەڕ** / xatûzimheř/: ☜ **خاتوزمهەریر**

**خاتوماسی** / xatûmasî/: ☜ **خەشەماسی**

**خاتون** / xatûn/: ناو. خا؛ خات؛ خاتێ؛ خاتە؛ خاتوو؛ خاد؛ وشەی ڕێز بۆ ژنان ‹خانا! چەند خانان، خاتوون و خانم/ بەرشین جەی دنیا، داخ داخانم «خانای قوبادی»› ▬ بانو

**خاتونسێمانکە** / xatûnsêmanke/: ناو. پەپووسێمانە؛ پەپووسلێمانە ▬ هُدهُد

**خاتونە** / xatûne/: ناو. گیایەکە وەک سێوەڕەی دەچێ، بەلام گەلاکانی وردترە ▬ گیاهی است

**خاتە** / xate/: ناو. *[سووکەڵە]* خاتێ؛ وشەی ڕێز بۆ

ژنان ☰ بانو

**خاتی** / xatî/: ☜ **خالتیك**

**خاتێ** / xatê/: ☜ **خاتە**

**خاج** / xac/: ناو. خاچ؛ یەكێ لە خاڵەكانی وەرەق ☰ خاج

**خاجە** / xace/: ناو. بازرگانی گەورە ☰ تاجر عُمده

**خاجەرۆ** / xacero/: ☜ **خازەڵێ**

**خاجەنشین** / xacen(i)şîn/: ناو. خواجەنشین؛ سەكۆی بەر درگای ماڵ بۆ دانیشتن ☰ خواجەنشین

**خاچ**[1] / xaç/: ناو. ١. چەلیپا ٢. ☜ **خاج** ☰ ١. صلیب ٢. ☜ **خاج**

**خاچ**[2]: ئاوەڵكار. ڕێك؛ یەكراست؛ ڕاست و بێ ڕاوەستان ‹خاچ چوو ناڤا ئاڤێ› ☰ یكراست

**خاچپەرست** / xaçperist/: ئاوەڵناو. فەلە؛ مەسیحی ☰ مسیحی

**خاچركان** / xaçirkan/: ناو. سێ كوچكەی كوانوو ☰ سه سنگ اجاق

**خاچك** / xaçik/: ☜ **خارچك**

**خاد** / xad/: ☜ **خات**

**خادان** / xadan/: ناو. هێكدان؛ هێلكەدان: ١. *[ڕووەكناسی]* بەشێك لە مێینەیی گوڵ كە بریەتییە لە یەك یان چەند هێلكۆكە و بە دوای پێگەیشتن دەبێتە میوە ٢. *[گیانەوەرناسی]* گەرادان؛ ئەندامی بەرهەمهێنەری خانۆكەی جینسی مێینە لە مۆرەدارەكاندا ☰ ١و٢. تخمدان

**خادم** / xadim/: ناو. خایەم: ١. خزمەتكار ٢. مجێوری مزگەوت ☰ ١. خدمتكار ٢. خادم مسجد

**خار**[1] / xar/: ناو. ١. زەوییی زۆر سەخت ٢. ئەشكەوت؛ شكەفت ٣. دروو؛ دڕك ٤. ڕەمڵ؛ ڕەڵم؛ زیخی ورد ٥. چوارە؛ تاو؛ تاخت ٦. هەڵمات؛ گۆگین ٧. ☜ **خاڵ**[1]**ـ١** ☰ ١. زمین سخت ٢. غار ٣. خار ۴. ریگ ۵. چهارنعل ۶. تیله ٧. ☜ **خاڵ**[1]**ـ١**

◘ **خار دان:** ١. غار كردن؛ ڕاكردن ٢. لنگار دان ٣. غار پێكردن؛ وە غار خستن ☰ ١. دویدن ٢. تاختن ٣. دواندن

**خار**[2]: ئاوەڵناو. ١. خاراو؛ ڕاهاتوو بۆ كار ٢. خوار؛ لار؛ گێڕ ☰ ١. آبدیده ٢. كج

**خارا** / xara/: ناو. جۆرێ پارچەی بەنرخ ‹ خارایی سەوز و شینی لەبەر كردووە جەبەل/ دامێنی وەردی سوورە، كە دەستم بە دامەنی «نالی»› ☰ نوعی پارچەی قیمتی

**خاراج** / xarac/: ☜ **خەراج**

**خاران** / xaran/: چاوگ. تێنەپەڕ. //خارای؛ دەخارێ؛ بخارێ// خارین: ١. لە كار دەرهاتن؛ ڕاهاتن لە كار ٢. پێگەییشتن ☰ ١. آبدیده شدن ٢. عمل آمدن؛ بار آمدن

■ ئاوەڵناوی بەركاری: خاراو/ چاوگی نەرێنی: نەخاران

**خاراندن** / xarandin/: چاوگ. تێپەڕ. //خاراندت؛ دەخارێنی؛ بخارێنە// غاراندن: ١. ڕاهێنان لە كار ‹خۆی لە نێو كارەسات و خوێن ڕژان و خوێن بەخشیندا گەوزاند و خاراند› ٢. سوور كردنەوەی هەوڕ ☰ ١. آبدیده كردن ٢. پُختن سفال

■ ئاوەڵناوی بەركاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەخاراندن

**خاراو** / xaraw/: ئاوەڵناو. خاریو: ١. ڕاهاتوو لە كار ‹نەوەستان دەوەستێ بە دەستێ/ كە خاراوی ئیش و سواوی سوێ بێ «سوارە»› ٢. سوورەوەكراو (هەوڕ) ☰ ١. آبدیده ٢. پُخته (سُفال)

**خارج** / xaric/: ناو. دەرەوە؛ هەندەران؛ وڵاتی بیانی ☰ خارج

**خارچك** / xarçik/: ناو. قارچك؛ خاچك؛ كارگ؛ كوارگ ☰ قارچ

**خارچكتەقیلە** / xarçikteqîle/: ناو. جۆرێك قارچكە لە كڵاو دەكا ☰ نوعی قارچ شبیه كُلاه

**خارچکجووینە** / xarçikcûyne/: ناو. جۆرێ قارچک لە ناو جارەجۆدا هەڵدەتۆقێ ≡ نوعی قارچ

**خارچکسەگانە** / xarçiksegane/: ناو. قارچکە گولانە ≡ نوعی قارچ سمی

**خارچکگەنمینە** / xarçikgen(i)mîne/: ناو. جۆرێک قارچکی نێو گەنمەجاڕ ≡ نوعی قارچ

**خارخاپوور** / xarxapûr/: ☜ **خاپوور**

**خار ـ خار** / xar xar/: ئاوەڵناو. لەت ـ لەت؛ شەقار ـ شەقار ≡ شرحه ـ شرحه

**خارخارێن** / xarxarên/: ناو. گرێوە غار ≡ مسابقەی دو

**خاردار** / xardar/: ئاوەڵناو. دڕکاوی؛ بەچقڵ؛ دڕوواوی ≡ خاردار

**خارز** / xariz/: ناو. ١. هەرمێشک؛ هەورێشک؛ ڕۆنی نانی گەرم تێدا کوشراو ٢. چێشتی میوانی کە لە ئارد و ڕۆن دەیکەن ≡ ١. ترید نان گرم و روغن ٢. کاچی

**خارسک** / xarsik/: ناو. ژنە گاور؛ ژنە فەلە ≡ زن مسیحی

**خارش** / xariş/: ☜ **خارشت**

**خارشت** / xarişt/: ناو. خارش؛ خوروو؛ خروو؛ ئالۆش؛ دۆخی سەرهەڵدانی ختووکە یان هەستۆکی لە خاڵێکی لەشدا کە دەبێتە هۆی خورین ≡ خارش

**خارن** / xarin/: ☜ **خواردن**

**خارنگە** / xaringe/: ☜ **خواردنگە**

**خاروف** / xaruf/: ناو. کووپەی دەم گوشاد ≡ خُم دهانه گُشاد

**خاروک** / xaruk/: ناو. پێڵاوی لە گیا چندراو ≡ پای افزار از گیاه بافته

**خارۆرە** / xarore/: ناو. هەرا و ئاژاوە ≡ آشوب و بلوا

**خارووز** / xarûz/: ناو. گەردانە کە لە گوێز دەیهۆننەوە ≡ گردنبند از دانه‌های گردو

**خارەسامی** / xaresamî/: ناو. جۆرە هەڵووچەیەکە، مزرە و لایەکی سوور و لاکەی‌تری زەردە ≡ نوعی آلوچه

**خارین** / xarîn/: ☜ **خاران**

**خاریو** / xarîw/: ☜ **خاراو**

**خارێز** / xarêz/: ناو. ١. پرپۆڵە ٢. هێلکە و ڕۆن ≡ ١. آش عدس و ریزه نان ٢. نیمرو

**خاز¹** / xaz/: ناو. ١. سوور؛ سۆر ٢. کاردوو؛ کاردی؛ ڕووەکێکی خۆڕسکی کوێستانییە بۆ خۆراک و دەرمان دەشێ ٣. جەغز؛ جغز ٤. ☜ **خازی-٢** ≡ ١. قرمز ٢. گل شیپوری ٣. دایره ۴. ☜ **خازی-٢**

• **خاز²**: پاشەوشە. ـ خواز ≡ ـ خواه

**خازباز** / xazbaz/: ☜ **خازیبار**

**خازبێنی** / xazbênî/: ☜ **خوازبێتی**

**خازتن** / xaztin/: ☜ **خواستن**

**خازخازۆک** / xazxazok/: ئاوەڵناو. خازۆک؛ خوازەڵۆک ≡ گدامنش

**خازگینی** / xazgînî/: ☜ **خوازبێتی**

**خازما** / xaz(i)ma/: ئاوەڵکار. خاسما؛ بەتایبەت؛ تایبەتی ≡ بەویژه

**خازوق** / xazuq/: ناو. غازوق؛ سنگێ کە لە کۆمی تاوانباریان دەبڕی ≡ میخ‌تویلەی مجازات!

**خازۆک** / xazok/: ☜ **خازخازۆك**

**خازە** / xaze/: ناو. خوازە؛ داخوازی؛ داواکاری ‹غەزەڵ گەر لەتیف و تەڕ و تازە بێ/ دەبێ تان و پۆی مووی بەری خازە بێ «ناری»› ≡ خواسته

**خازەڵێ** / xazełê/: ناو. خاجەڕۆ؛ گەمەیەکی شەوانەی لاوانە ≡ از بازی‌های گروهی جوانان

**خازی** / xazî/: ناو. ١. ☜ **خوسار** ٢. خاز؛ گوڵخاز؛ گوڵەهاز؛ گوڵەکاردۆ؛ گوڵێکە لە شەپوور دەکا و بۆ سۆمای چاو یا لابردنی زەرداو بەکەڵکە

٣. ئـارەزووی؛ ئـاوات ☰ ١. ☜ خوسـار ٢. گـل شیپوری ٣. آرزو

**خازیبار** / xazîbar/: ناو. خازباز؛ قالۆچەی کەسک کە دەڵێن بۆ دار زیانی هەیە ☰ سوسک سبز

**خازیک** / xazîk/: ناو. داخ؛ حەسرەت ☰ افسوس

**خاژ** / xaj/: ئاوەڵناو. خز؛ خلیسک ☰ لیز

▣ **خاژ بوون** خلیسـکان؛ هەڵخلیسـکان ☰ لیـز خوردن

**خاس**[1] / xas/: ناو. ١. کاهوو ٢. گـزی؛ فـێڵ ☰ ١. کاهو ٢. فریب

**خاس**[2]: ئاوەڵناو. باش؛ چـاک؛ خـوو؛ هـوو؛ هـەول؛ هاولە: ١. وەش؛ بە چۆنیـەتی دڵـخوازەوە ‹هـەوا خاسـە› ٢. خـاوەن ڕەفتـار و کـرداری چـاک و دڵخواز ‹پیاگ خاس› ٣. وەش؛ چابووەوە ‹حالـی خاس بووەسەو› ☰ ١تا٣. خوب

▣ **خاس بوون** چاک بوون؛ بە کەڵک بـوون ☰ بـە درد خوردن؛ خوب بودن

**خاس بوونەوە** چـاک بوونـەوە؛ لـە نەخۆشـی هەستانەوە ☰ شفا یافتن

**خاس کردن** ١. چا کردن؛ چێ‌کـرن ٢. تاشـین/ ڕێک کردن (سەر و سمێڵ) ☰ ١. درسـت کـردن ٢. اصلاح کردن

**خاس کردنەوە** چاک کردنەوە؛ دروست کردنەوە ☰ تعمیر کردن

**خاس**[3]: ئاوەڵکار. چاک ‹خاست فەرماوان ئەربابەکەی خەم/ ساکن نە گۆشەی بالاخانەی چەم «مەولەوی»› ☰ خوب

▣ **خاس کردن** کاری چـاک کـردن ‹خاسـت کـرد هاتی› ☰ خوب کردن

**خاستر**[1] / xastir/: ئاوەڵناو. چاکتر؛ باشتر ‹ئـەم دانـە خاسترە› ☰ بهتر

**خاستر**[2]: ئاوەڵکار. چاکتر؛ باشـتر ‹مـن خاسـتر ئـەو کارە ئەکەم› ☰ بهتر

**خاس . خاس** / xas xas/: ئاوەڵکار. چاک ـ چـاک؛ بـە چـاکی ‹عەجـەب بـادەن! عەجـەب هـەورەن! عەجەب وەشت!/ چە خاس ـ خاس نم مـەدۆ ساراو دەر و دەشت! «سەیدی»› ☰ خوب

**خاسما** / xas(i)ma/: ☜ خازما

**خاسۆک** / xasok/: ☜ خاسوک

**خاسوک** / xasûk/: ئاوەڵـناو. خاسـۆک؛ فێڵـباز ☰ فریبکار

**خاسە**[1] / xase/: ناو. ١. ملکی دەوڵەت ٢. گۆشـت و ماسوولکەی دەوری پەراسوو ٣. خاسی؛ چاکـە ☰ ١. خالصە ٢. عضلات بین دندەها ٣. خوبی

**خاسـە**[2]: ئاوەڵـناو. ١. تایبـەتیی کەسـێک ٢. هەڵبژاردە ٣. ڕەسەن؛ ماک ☰ ١. مخصوص کسی ٢. برگُزیده ٣. اصل

**خاسە ـ**[3]: پێشوشە. چـاک ‹خاسـەکەو؛ خاسـەڕەنگ؛ خاسەماڵ› ☰ بە ـ

**خاسەخۆر** / xasexor/: نـاو. خـۆش‌خـۆراک ☰ خوش‌خوارک

**خاسەڕەنگ** / xaseřeng/: ناو. ١. خۆڕەنگ؛ ڕەنگـێ کە ناچێتەوە ٢. خاکێکی سوورە بۆ دەرمان و بـۆ ڕەنگ دەبێ ☰ ١. رنـگ ثابـت ٢. خـاکی قرمـز بـا مصرف دارویی و رنگرزی

**خاسەسی** / xasesî/: ناو. سـی؛ سـی‌خاسـە؛ پینـە؛ پینەک؛ شاقاز؛ قەبەغاز؛ مەلێکی کۆچەرە خێزانی قاز و لە تیرەی وەردۆکان، ٧٥ تا ٨٥ سانتی‌میتـر درێژە، دندووکی لەوانی‌تر گەورەترە، پـەڕ و باڵـی بۆر و ڕێ ـ ڕێیە، بە دەستە دەفڕن، لە ناو قامیش و جەگەندا هێلانە دەکەن ☰ غاز خاکستری

**خاسەکەش** / xasekeş/: نـاو. زەمینـێ کە بـاش ئـاو درابێ و شوێنی وشکی لێ نەمابێ ☰ زمین خـوب آبیاری شده

**خاسەکەو** / xasekew/: ☜ کەو ـ١

**خاسەکی** / xasekî/: ☜ خاسەیی

**خاسەیی** / xaseyî/: ئاوەڵناو. خاسەکی؛ تایبەت؛ تایبەتی ▪ ویژه

**خاسی** / xasî/: ناو. باشی؛ چاکی؛ ڕندی ▪ خوبی؛ نیکویی

**خاسییەت** / xasîyet/: ناو. ١. تایبەتمەندی ‹خاسییەتێکی ڕاستی تیا نەدین/ دەریان پەڕاندن لێیان کەوتنە قین «پیرەمێرد»› ٢. کاریگەری؛ کارکۆیی ‹سابوونی کەففی پێیە کەفی زاری چاپلووس/ خاسییەتی ڕەققی هەیە نەرمی زوبانی لووس «نالی»› ▪ ١. ویژگی ٢. اثر

**خاش**[1] / xaş/: ناو. ١. قاش؛ کووز؛ تیکەیەکی بڕاو لە شتێ ٢. نقێمی ئەنگوستیلە ٣. پڕ و پووش ▪ ١. قاچ ٢. نگین انگشتر ٣. خس و خاشاک

**خاش**[2]: ئاوەڵناو. زۆر ورد ▪ بسیار ریز

**خاشاک** / xaşak/: ☜ **خاشاڵ**

**خاشاڵ** / xaşał/: ناو. خاشاک؛ چیلکە و چاڵ؛ پڕ و پووش ▪ خس و خاشاک

**خاشخاش**[1] / xaşxaş/: ناو. ١. خاشخاشک؛ خەشخاش؛ ڕەبەنۆک؛ مەنگەگیا؛ سەبیلەگیا؛ گیایەکی ئاڵفی بە گەڵای گەورە و نەرم و ڕۆشن، گوڵی گەورەی سپی، سوور، سوورکاڵ یان بەنەوشەوە کە شیلەکەی دەکرێتە تریاک ٢. پاوانەی بە زەنگۆڵە ▪ ١. خشخاش ٢. زیور پای زنان

**خاش ـ خاش**[2]: ئاوەڵناو. ڕێزە ـ ڕێزە؛ ورد و خاش ‹داش بە دووشانەی دۆش ڕۆستەمدا/ قەڵخان بی خاش ـ خاش ڕێزا وە هەمدا «شانامەی کوردی»› ▪ خُرد و خاکشیر

**خاشخاشک** / xaşxaşik/: ☜ **خاشخاش**[1]**ـ١**

**خاشخاشکە** / xaşxaşke/: ناو. کورکەنیسان؛ چارەچەقیلە ▪ نوعی خشخاش بی‌غوزە

**خاشخاشکەمارە** / xaşxaşkemare/: ناو. جۆرێک گوڵە خاشخاشکە، گوڵەکەی گەورەتره لە خاشخاشکی ئاسایی و سووری مەیلەو نارنجییە. بە قەد قامکە تیتۆڵە دەبێ و زیاتر لە بوورە و بەردەڵان دەڕوێ ▪ نوعی شقایق

**خاشخاشۆکێ** / xaşxaşokê/: ناو. خاشخاشک؛ چارەچەقیلە ▪ شقایق

**خاشە**[1] / xaşe/: ناو. ١. ڕووشە ٢. پڕ و پووش ٣. وردە و پردە ٤. توخم سفێ؛ شەوەرگە؛ شەوەرە؛ شەوەن؛ ڕوەکێ لە تیرەی شەوەرگ کە ئاڵفێکی خۆش‌خۆراکی ئاژەڵە ▪ ١. خراش ٢. خس و خاشاک ٣. ریزە؛ خُردە ۴. اسپرس

◻ **خاشە کێشان**: [کنایە] ١. سەر بڕین ‹هەوری ئاسمان بێ خەلاتم باشە/ یا لەشم خاشە بکێشن باشە «سوارە»› ٢. [پلار] تەواو کردنی خۆراک و هیچ نەهێشتن ▪ ١. سر بُریدن ٢. تمام خوردن و چیزی باقی نگذاشتن

**خاشە ـ**[2]: پێشوشە. وردە؛ وردە و پردە ‹خاشەشیشە؛ خاشەبەرد› ▪ خُردە ـ

**خاشەبڕ** / xaşebiř/: ناو. بنەبڕ: ١. کار و ڕەوتی لە بێخ دەرهێنانی دار یان گیایەک ٢. [کنایە] کارەڕەهاتی کوشتن و قەڵت‌وبڕ کردنی خەڵکی شوێن یان ناوچەیەک ▪ ١. ریشەکنی ٢. نسل‌کُشی

◻ **خاشەبڕ کردن**: بنەبڕ کردن؛ توخم بڕین ▪ ریشەکن کردن

**خاشیرە** / xaşîre/: ☜ **خاکشیر**

**خاشیل** / xaşîl/: ناو. کەشکەکی سەر بە ڕۆن؛ شیوی گەنمە کوتاو کە ڕۆنی بە سەرا دەکەن ▪ آش گندم نیمکوب با روغن

**خافڵ** / xafił/: ئاوەڵناو. غافڵ؛ های لێ نا؛ بێ‌خەبەر ▪ غافل

**خافڵان** / xafłan/: چاوگ. غافلان: ١. سەرقاڵ بوون؛ ئاگا لێبڕان ٢. هەڵخەڵەتان؛ فریو خواردن ▪ ١. سرگرم شدن ٢. فریب خوردن

**خافڵاندن** / xafłandin/: چاوگ. غافلاندن: ١.

سەرقاڵ کردن؛ سەر لێ تێکدان ٢. هەڵخڵەتاندن؛ فریودان ☰ ١. سرگرم کردن ٢. فریب دادن

**خافور** / xafûr/: ئاوەڵناو. والا؛ ناوبەتاڵ ☰ میان‌تُهی

**خاڤ** / xav/: ئاوەڵناو. خاو: ١. نەڕێسراو ٢. نەکولاو؛ لێنەندراو ٣. کاڵ؛ نەگەیشتوو ☰ ١. تاب‌نخورده ٢. ناپخته ٣. کال؛ نارسیده

**خاڤر** / xavir/: ناو. گیایەکە دەرمانی مایەسیرییە ☰ گیاهی داروی بواسیر

**خاڤک** / xavik/: ناو. ١. کەلەکە؛ خاڵیگە ٢. کووتاڵی ڕزیوی دڕاو ٣. دەسماڵی تەنکی سەری ژنان ☰ ١. تُهیگاه ٢. پارچەی پوسیده ٣. روسری نازک زنانه

**خاڤلو** / xavlû/: ☜ خاولی

**خاڤە** / xave/: ناو. پێستی لە دەباغ نەدراو؛ پێستی خاو ☰ پوست دباغی نشده

**خاڤەکی** / xavekî/: ئاوەڵناو. خاو؛ داهێزاو ☰ سُست

**خاک**[1] / xak/: ناو. ١. ئاخ؛ خۆڵ؛ گەرد و تۆزاڵێ کە لە ورد و خاش بوونی بەرد و ماکی زیندەڵ بەدی دێ ‹خاکی قسلی› ٢. زەوی؛ ئاخ؛ تۆژێکی ناسک لە پێستەی زەوی کە ئەم ماکانەی تێدایە ٣. زەوی؛ پارچەیەک زەوی بۆ ماڵ کردنەوە ٤. /مەجاز/ گۆڕ؛ قەبر ‹چ خاس خاس شنیۆ نە ئێواراندا/ سەوزە وە ڕووی خاک جەرگەی یاراندا «مەولەوی»› ٥. /مەجاز/ سەرزەوین؛ نیشتمان ‹خاکی کوردستان› ٦. خۆڵ؛ تۆز ‹کتێبەکان خاکیان لێ نیشتبوو› ☰ ١و٢. خاک ٣. قطعه زمین شهری ۴. تُربت؛ قبر ۵. سرزمین ۶. گرد و خاک

▣ **خاکە چەرمگە**: گڵە سپی کە بۆ سواغی دیواری وەتاغی دە کار دەکەن ☰ نوعی خاک سفید

**خاکە ڕەشە**: گڵەڕەشە؛ خاکی زۆر نەخت و بەهێز ☰ خاک هوموسی

**خاکە سوورە**: ئیربار؛ خاکی نەرمی دەنک ورد، بابەتی هەوڕگەری ☰ خاک رُس

▣ **خاک بە سەر بون**: /کینایە/ ڕۆژڕەش بوون؛ بێ دەرەتان بوون ‹قەت وا دەبێ خاکی دەری تۆ تاجی سەرم بێ/ ئەو دەوڵەتە بۆ من نییە ئەی خاک بەسەری من! «وەفایی»› ☰ خاک بر سر بودن

**خاکی بەر پێی کەسێک بون**: /کینایە/ لە بەرامبەری کەسێکدا زۆر کەم بوون یان خۆ بە کەم زانین ‹بەرەو بەرزایی دەچم گەرچی وردم/ خاکی بەر پێی تێکۆشەرێکی کوردم «هێمن»› ☰ خاک پای کسی بودن

**خاکی شوێنێ بە توورەکە کێشان**: /کینایە/ شوێنێ وێران کردن و لە ناو بردن ☰ خاک جایی را بە توبره کشیدن

**خاکی کوێ بە سەردا کردن**: /کینایە/ دامان؛ دەرەتان بۆ نەمان ‹کە تۆ ڕۆیی، لەبەر چاوم کورەی خاکی بە ئاوا چوو/ لە پاش تۆ، ئەی گوڵی نەوڕەستە! خاکی کوێ بەسەرداکەم؟ «وەفایی»› ☰ بیچاره بودن

**خاکی مردو لێ پژان**: /کینایە/ ١. کوندەبەبوو هێلانە کردن؛ پەپوو خوێندن؛ نەبوونی جم و جووڵی ژیان لە شوێنێکدا ٢. زۆر بێ‌دەنگ و باس بوون ☰ ١. هیچ آثاری از حیات نماندن ٢. بسیار آرام و ساکت بودن

**خاک**[2]: ئاوەڵناو. قار؛ لالووت؛ ڕەنجاو ‹سێ ساڵ لەگەڵمدا خاک بوو› ☰ قهر

**خاکاو** / xakaw/: ناو. کار و ڕەوتی ئاو دانی دێراوی تازە هەڵدراو بەر لەوەی شەتڵ و تووەکەی تێدا بچێنن ☰ آب دادن خاک جالیز قبل از کاشت

**خاکاوی** / xakawî/: ئاوەڵناو. تۆزاوی؛ خۆڵاوی ☰ خاک‌آلود

**خاکبازی** / xakbazî/: ناو. کاری گاڵتە بە خۆڵ

کردن ☰ خاکبازی

**خاکبێژ** / xakbêj/: ناو. سەرەن؛ سەرەند؛ سەڕەند؛ سەرەد؛ سەڕەد؛ سەڕەت؛ کەو؛ کارماخ؛ پەڕەیەکی تۆڕی درشتچن لە تێل کە بۆ جیاکردنەوەی درشت لە ورد بەکار دێ ☰ سَرَند

**خاکری** / xak(i)rî/: ناو. خاکەری؛ خۆڵەکەوە؛ خۆڵەمێش ☰ خاکستر

**خاکڕن** / xakřin/: ناو. کاری خیشک لە شێوەرد دان ☰ عمل هموار کردن زمین شخم شده

**خاکڕێز** / xakřêz/: ☜ خاکڕێژ

**خاکڕێژ** / xakřêj/: ناو. خاکڕێز؛ تەپە خاک، بەتایبەت گردۆڵەی دەسکردی ئەم شان و ئەو شانی ڕووبار، ئاوەڕۆ یان چاڵ ☰ خاکریز

**خاکڕێژی** / xakřêjî/: ناو. کار و ڕەوتی قوڵکە پڕ کردنەوە بە خاک، پتر بۆ کار و باری خانووسازی ☰ خاکریزی

**خاکژن** / xakjin/: ناو. شەنکێش؛ چەوکێش ☰ شن‌کش

**خاکژی** / xakjî/: ناوەڵناو. خووگرتوو و تایبەتمەند بە ژیان لە ناو خاکدا ‹کرمی خاکژی› ☰ خاکزی

**خاکسار** / xaksar/: ☜ خاکەسار

**خاکسپێری** / xaks(i)pêrî/: ناو. دەفن؛ کار و ڕەوتی ناشتن؛ تەمراندن ☰ دفن

**خاکسەر** / xakser/: ناو. خۆڵەمێش؛ خۆڵەکەوە؛ خۆلی ☰ خاکستر

**خاکشیر** / xakşîr/: ناو. ١. شێوەران؛ خۆلوشێر؛ خوەلەشێرە؛ خاشێرە؛ پاقلانجی؛ پەقلانجقە؛ پاقلانچکە؛ پاقلانجقی؛ پاقلەجقی؛ گیایەکی یەکساڵانەی ناوچەی کەمئاوە، بە گەڵای برگەبرگەی زۆر و گوڵی زەرد و ڕۆشن و تۆمی وردەوە ٢. شێوەران؛ خۆلوشێر؛ خوەلەشێرە؛ خاشیرە؛ بەری وردی ئەو گیایە کە بۆ دەرمان باشە ☰ ١و٢. خاکشیر

**خاکناسی** / xaknasî/: ناو. ئاخناسی؛ زانستی ورد بوونەوە و وەرد دانەوەی خاک، سەرچاوە و تایبەتمەندییەکانی ☰ خاک‌شناسی.

**خاکنشین** / xakn(i)şîn/: ☜ خاکەسار

**خاکوپا** / xak û pa/: ناو. *[مەجاز]* کاری کەوش و لاقی گەوران ماچ کردن ☰ پابوسی

**خاکوخۆڵ** / xak û xoł/: ناو. خاک و دەنکە وردەکانی بە تێکڕا ☰ خاک‌وخول

**خاکوەج** / xakwec/: ناو. جووتیار ☰ کشاورز

**خاکە** / xake/: ناو. ١. تۆز؛ ماکی هاڕدراو ٢. پێشکە؛ جۆرێ مێشوولە ☰ ١. خاکه ٢. نوعی پشه

**خاکەر** / xaker/: ناوەڵناو. هێلکەکەر ☰ تخمگذار

**خاکەری** / xakerî/: ناو. خاکری؛ خۆڵەمێش ☰ خاکستر

**خاکەڕا** / xakeřa/: ناوەڵناو. *[کینایە]* خاکەسار؛ خاکسار؛ بێ دەعیە و دەمار؛ خاکەسار ☰ متواضع

**خاکەڕایی** / xakeřayî/: ناو. *[کینایە]* بێ‌پۆز و هەوا بوون؛ کاری خۆ شکاندنەوەی لە ئەندازە بە دەر ☰ خاکساری؛ تواضع

**خاکەڕۆک** / xakeřok/: ☜ خاکەڕۆ

**خاکەڕۆ** / xakeřo/: ناو. خاکەڕۆک؛ کاری ماڵینی بن خەرمان ☰ خاکروبی جای خرمن

**خاکەڕەژی** / xakeřejî/: ناو. گەردە؛ خاکەسوخاڵ ☰ خاکه زغال

**خاکەسار** / xakesar/: ناوەڵناو. *[کینایە]* خاکسار؛ خاک‌نشین: ١. خاکەڕا؛ بێ دەعیە و دەمار ٢. کلۆڵ؛ داماو ‹پۆشاکی نەدار و خاکەساران/ خۆراک و بژیوەکەی هەژاران «هەژار، *مەم‌وزین*»›. هەروەها: **خاکەساری** ☰ ١. متواضع ٢. درمانده

**خاکەسەر** / xakeser/: ناوەڵناو. قوڕبەسەر؛ بێچارە ☰ بیچاره

**خاکەقەند** / xakeqend/: ناو. وردەقەند؛ وردەقەن ☰ خاکەقند

**خاکەلێوە / xakelêwe/**: ناو. ١. سەرەتای بەهار ٢. نەورۆز؛ ئاخەلێوە؛ ئاخلێڤە؛ ئاخلێڤ؛ ئاخلێڤە؛ قاتەلێوە؛ قاتەولێوە؛ هەرمێ پشکوان؛ یەکەمین مانگی بەهار کە ٣١ ڕۆژە ☰ ١. اوایل بهار ٢. فروردین

**خاکەمرمەند / xakemiřmend/**: ناو. براده ☰ بُراده

**خاکەناز / xakenaz/**: ناو. خاکەنداز؛ خاکەناس: ١. مەدونە؛ کەرەسەیەک بە لێوارەیەکی باریک و ڕوویەکی تەختەوە، بۆ هەڵگرتنی خاک، خۆڵ و خۆڵەمێش ٢. بێلۆچکەی زبڵ کۆ کردنەوە ٣. پێمەڕە؛ بێڵ ☰ ١و٢. خاک‌انداز ٣. بیل

**خاکەناس / xakenas/**: ☜ خاکەناز

**خاکەنداز / xakendaz/**: ☜ خاکەناز

**خاکی / xakî/**: ناوەڵناو. ١. بۆر؛ بە ڕەنگی قاوەیی ڕۆشنی ئاماڵ زەرد ٢. گڵی؛ خاکی؛ لە خاک؛ خروتی؛ لە جنسی خاک ‹گردی خاکی› ٣. گیرۆ یان پێوەندیدار بە خاکەوە ‹کرمی خاکی› ٤. *[کنایە]* بێ‌فیز و دەمار ☰ ١تا٣. خاکی ٤. متواضع

**خاگ / xag/**: ناوەڵناو. خاو؛ نەکولاو؛ نەگەیشتوو ☰ خام

**خال / xal/**: ☜ خاڵ

**خالانە / xalane/**: ناو. قسەی دڵخۆشکەرەی فالگرەوە ☰ پیش‌بینی فالبین

**خالتیک / xaltîk/**: ناو. خاتی؛ خالەک؛ خالتیک؛ خالتێک؛ خاماجی؛ پوور؛ میمک؛ خوشکی دایک ☰ خاله

**خالتێک / xaltêk/**: ☜ خالتیک

**خالخالک / xalxalik/**: ناو. ١. ☜ سپڵ ٢. ☜ خاڵخاڵۆکە_١

**خالخالۆک / xalxalok/**: ☜ خاڵخاڵۆکە_١

**خالخالۆکە / xalxaloke/**: ☜ خاڵخاڵۆکە_١

**خالۆ / xalo/**: ☜ خاڵ _٢

**خالەک / xalek/**: ☜ خالتیک

**خالەکوکومە / xalekukume/**: ناو. کوند؛ بایەقوش؛ بوو ☰ جُغد

**خالی / xalî/**: ناوەڵناو. خاڵی؛ والا؛ بەتاڵ ☰ خالی

**خالیگە / xalîge/**: ☜ خاڵیگە

**خاڵ[١] / xał/**: ناو. خاڵ: ١. خار؛ نوختە یان نیشانەی سەر پێست ‹وەنەوشەی مۆری لە گل دەرهاتوو/ خاڵێکی جوانی ڕووی نیگارێکە «گۆران»› ٢. خالۆ؛ خالۆ؛ خالوو؛ ئالۆ؛ لالۆ؛ لالە؛ خار؛ برای دایک ‹برا و دراوسێ و هاوماڵت/ باب و دایک و مام و خالت «هەژار، *بۆکوردستان*»› ٣. نوقتە ‹مێرگی ئاسمان بە سووتمانی هەوری لۆکەیی نەزۆک/ پڕ لە خاڵ و قۆپەنە «سوارە»› ٤. بابەتی ڕوون و زەق ☰ ١. خال پوست ٢. دایی ٣. نقطه ۴. نکته

◻ **خاڵ کوتان**: دەقان؛ دەقاندن؛ وێنە کێشان لە سەر پێست ☰ خال کوبیدن

**خاڵ و میل ڕشتن**: ١. نەخش و خاڵ کوتان ٢. *[کنایە]* خۆ جوان کردن؛ خۆ ڕازاندنەوە ☰ ١. خالکوبی کردن ٢. آرایش کردن

**خاڵ[٢]**: پێرۆ. ← **خشت‌وخاڵ**

**خاڵان / xałan/**: ناو. خالوان؛ هۆزی دایک ☰ خویشاوندان مادری

**خاڵانە / xałane/**: ناو. کاری ناشیرین و بێ‌شەرمانە ☰ اعمال زشت و ناپسند

**خاڵاوی / xaławî/**: ☜ خاڵ _ خاڵ

**خاڵبەڵەک / xałbełek/**: ناو. ١. ڕەشایی ناوڕاستی بەفران ‹سەری کوێستان خاڵبەڵەکە/ جێژنی مامڕێوی و دەڵەکە «هەژار، *بۆکوردستان*»› ٢. دووهەم مانگی بەهار ☰ ١. سپید و سیاهی کوه از آب شدن برفها ٢. ماه اردیبهشت

**خاڵبەندی / xałbendî/**: ناو. کاری دانانی نیشانەگەلی تایبەت (وەک: «.» و «،» و «؛» و «:» و «؟» و «!» و «_» و ...) لە نووسراوەیەکدا، بۆ ڕوون کردنەوەی مانا و دروست خوێندنەوە و باش

تێگەیشتنی خوێنەر 🇮🇷 نقطه‌گذاری

**خاڵتیک** / xałtîk/: ☜ **خاڵتیك**

**خاڵخاس** / xałxas/: ئاوەڵناو. جوان؛ لەبەردڵان؛ بەدەو ‹ئیسا خاڵخاسان لێم مەدەن تانە/ بیمەوە تەمەڵ قاپی دەرگانە «میرزا شوکروڵا دیناروەند»› 🇮🇷 زیبا

**خاڵ.خاڵ** / xał xał/: ئاوەڵناو. خاڵخاڵی؛ خاڵدار؛ خاڵاوی؛ پەڵەپەڵە؛ زۆر پەڵاوی ‹کوێستانان خاڵخاڵ بەفری ناچێتەو/ قیبلەم تۆراوە، ئاشتی ناوێتەو «فولکلۆر»› 🇮🇷 خالخالی

**خاڵخاڵک** / xałxałik/: ☜ **خاڵخاڵۆکە-١**

**خاڵخاڵۆک** / xałxałok/: ☜ **خاڵخاڵۆکە-١**

**خاڵخاڵۆکە** / xałxałoke/: ناو. ١. خاڵخاڵۆکە؛ خاڵخاڵۆک؛ خاڵخاڵک؛ خاڵخاڵک؛ خاڵۆزە؛ مامەڵە؛ مامەڵێ؛ ماماڵە؛ سپل؛ ماڵخاڵوو؛ ماڵخاڵوو؛ مامەڵەسووورە؛ ماڵماڵەسوورە؛ ماماڵەسووورێ؛ ماڵهاڵوو؛ شەمامە؛ فاتەڕەشە؛ گوێرەکەسوورە؛ جۆرێ مێرووی ژێر زگ و پا ڕەشی قاپ سووری خاڵ ڕەشە ٢. گوڵەئەستێرە ٣. شەنگە مانیانە؛ ئەسپنگە ماینە 🇮🇷 ١. کفشدوزک ٢. کرم شب‌تاب ٣. از گیاهان خوارکی

**خاڵخاڵی** / xałxałî/: ☜ **خاڵ - خاڵ**

**خاڵدار** / xałdar/: ئاوەڵناو. ١. نیشاندار ٢. خاڵخاڵی 🇮🇷 ١. خالدار ٢. خالخالی

**خاڵکوت** / xałkut/: ناو. کەسێ کە خاڵی دەسکرد لە پێست نەخش دەکا 🇮🇷 خالکوب

**خاڵلەڕوو** / xałleřû/: ئاوەڵناو. بەخاڵ؛ خاوەن خاڵ لە ڕوومەتدا 🇮🇷 دارای خال در صورت

**خاڵوان** / xałwan/: ☜ **خاڵان**

**خاڵوخەت** / xał û xet/: ناو. *[کینایە]* خاڵومیل؛ ڕەوتی بە خۆدا هاتن و جوانتر بوونی دڵبەر ‹وتم چ بوو نەمامم! بە خاڵوخەت نەماوی؟/ وەکوو بەهاری سونبول بلاو و تێکشکاوی «وەفایی»› 🇮🇷 خطوخال

**خاڵومیل** / xał û mîl/: ناو. ١. نەخشی مل و سینگ (کەو و تاوس و ...) ٢. ☜ **خاڵوخەت** ٣. کاری ڕەش کردنی تەوێڵی منداڵی ساوا لە ترسی چاوزار 🇮🇷 ١. خط و خال گردن و سینه (کبک و ...) ٢. ☜ **خاڵوخەت** ٣. عمل سیاه کردن پیشانی نوزاد از ترس چشم بد

**خاڵۆ** / xało/: ☜ **خاڵ -٢**

**خاڵۆزا** / xałoza/: ناو. فرزەندی خاڵ 🇮🇷 فرزند دایی

**خاڵۆزازا** / xałozaza/: ناو. نەوەی خاڵ 🇮🇷 نوەی دایی

**خاڵۆزە** / xałoze/: ناو. ١. خاڵخاڵۆکە ٢. گیایەکە لە دار و مێوان دەئاڵێ و بەرەکەیان وشک دەکا 🇮🇷 ١. کفشدوزک ٢. گیاهی است

**خاڵۆژن** / xałojin/: ناو. لالۆژەنی؛ زنالۆ؛ ژنی خاڵ 🇮🇷 زن‌دایی

**خاڵۆوەڵەد** / xałoweled/: ☜ **خاڵەوەڵەد**

**خاڵو** / xałû/: ☜ **خاڵ -٢**

**خاڵوزە** / xałûze/: ناو. کویروو؛ بەڵایەکی گەنمە، ڕەشی هەڵدەگیرێ 🇮🇷 سیاهک آفت گندم

**خاڵە** / xałe/: ناو. وەستای ئاسنگەر؛ ئاسنگەر 🇮🇷 آهنگر

**خاڵەخشکێ** / xałexişkê/: ناو. خلیسکێن؛ خلیسکانێ؛ خزخزەکانێ 🇮🇷 سُرسُره‌بازی

**خاڵەخەمە** / xałexeme/: ناو. خەمخۆری هەموان 🇮🇷 سنگ صبور همگان

**خاڵەڕەشە** / xałeřeşe/: ناو. گیایەکە لە کەرەوز دەکا و لقەکەی ڕەشە 🇮🇷 گیاهی شبیه کرفس با ساقه‌های سیاه

**خاڵەوەڵەد** / xałeweled/: ناو. خاڵۆوەڵەد؛ منداڵێ کە زۆر لە خاڵی دەچێ 🇮🇷 بچه‌ای که به داییش رفته

**خاڵهوما** / xałhuma/: ناو. جۆرێ کۆتری بەڵەکە 🇮🇷 نوعی کبوتر خالخالی

**خالّی** / xałî/: ئاوەڵناو. هاڵی: ١. بەتاڵ؛ بەوش؛ پەتی؛ چۆڵ؛ والا؛ هویل؛ وەلا؛ بە بۆشایییێک کە شتێکی تێدا نییە ‹ژووری خالی› ٢. نەگیردراو؛ نەگیراو؛ بەتاڵ ‹کورسی خالی› ٣. ڕووت؛ پەتی؛ تەنیا؛ تەنێ؛ بێ شتێکی دیکە ‹نانی خالی› 🇮🇷 ١تا٣. خالی

**خالّیخالّی** / xałîxałî/: ناو. گەمەیەکە گەورە دەگەڵ منداڵی دەکەن 🇮🇷 نوعی بازی با بچەها

**خالّیگە** / xałîge/: ناو. خالیگە؛ غالیگە؛ کەلەکە؛ برک؛ قەبرغە 🇮🇷 تُهیگاه

**خالّیوخەوالّە** / xałîwxewałe/: ئاوەڵناو. خت‌وخالی؛ بێ هیچ شت؛ والا؛ بەتاڵ ‹کایەنی خالی‌وخەوالە ئاخوڕی پڕ بوو لە هیچ!/ وەک ژنێ بێزوو بکا، بێزووی ئەکرد بۆ چۆڕێ ئاو «قانع»› 🇮🇷 خالی

**خام**[1] / xam/: ناو. ١. قەنەوز؛ خامەک؛ پارچەیەکی بنەوشە ٢. قوماشی سپی بۆ کراس و دەرپێ ٣. چەرمی خۆش‌نەکراو؛ چەرمی خاو 🇮🇷 ١. قناویز ٢. متقال ٣. چرم خام

**خام**[2]: ئاوەڵناو. ١. خاو؛ نەڕێسراو ٢. نەکوڵاو ٣. *[مەجاز]* فەقیرۆکەی کەمزان 🇮🇷 ١. تابنخورده ٢. خام؛ نپخته ٣. هالو

**خاما** / xama/: ناو. کچی عەزەو؛ کیژێ کە وەختی شوو کردنی هاتووە 🇮🇷 دختر دمبخت

**خاماجی** / xamacî/: ☜ **خالتیك**

**خامبا** / xamba/: ناو. خانەبا؛ ئاوسانێکی کەمی بێ‌برین لە پێست 🇮🇷 ورم اندک پوست

**خامحەلاوە** / xamĥelawe/: ناو. جاو؛ جۆرێ خام ‹بەرهەڵبێنەی خامحەلاوە، هەر دەڕۆیی و دەکراوە «فولکلۆر»› 🇮🇷 نوعی متقال

**خامخۆر** / xamxor/: ئاوەڵناو. کاڵخۆر؛ تایبەتمەندی کەسێ کە تەنیا شتی کاڵ و دەس تێ‌نەدراو و زیندوو (وەک سەوزی و میوە) دەخوا 🇮🇷 خامخوار

**خامخۆری** / xamxorî/: ناو. کاڵخۆری؛ کار و ڕەوتی خواردنی خواردەمەنی بە شێوەی نەکوڵاو، بەتایبەت سەبزی و میوە و دانەوێڵە 🇮🇷 خامخواری

**خامک** / xamik/: ناو. بەڵمی کونجی؛ کای کونجی 🇮🇷 کاه کنجد

**خامکار** / xamkar/: ئاوەڵناو. ساویلکە و خاوەن کار و کردەوەی نەپوخت ‹گەر عاشقی لە خوونی جگەر قومدە! دەم‌مەدە!/ مەیخوارە خامکارە هەتا هاوهوو دەکا «مەحوی»› 🇮🇷 خام؛ بی‌تجربه

**خامۆخ** / xamox/: ناو. خامۆغ؛ خامووز؛ یەکەم جار ئاو دانی زرعات 🇮🇷 اولین آبیاری کشتزار

**خامۆش** / xamoş/: ئاوەڵناو. خامووش؛ ئامۆش: ١. کوژاوە؛ کوور؛ خەمۆ؛ سل‌لوو؛ سرکوت؛ بێ‌ڕووناکی یان تیشک ‹ئەستێرەی خامۆش› ٢. کوژاوە؛ بێ‌ئاگر، تین یان تیشکی گەرمایی ‹کوورەی خامۆش› ٣. *[ئەدەبی]* بێدەنگ؛ ئارام؛ کپ؛ کڕ؛ بێ هەست‌وخوست ‹لە ناو شاری دلانا جاڕ ئەدەن کێ بێ کە هوشیار بێ؟/ لە هیچ لایەک جواب نایە، عەجەب خامۆش شاریکە! «پیرەمێرد»›. هەروەها: **خامۆشی** 🇮🇷 ١و٢. خاموش ٣. ساکت

⊡ **خامۆش بوون**: ١. کوژانەوە ٢. *[کینایە]* بێ‌دەنگ بوون 🇮🇷 ١. خاموش شدن ٢. ساکت شدن

**خامۆش کردن**: کوژاندنەوە 🇮🇷 خاموش کردن

**خامۆغ** / xamoğ/: ☜ **خامۆخ**

**خاموت** / xamût/: ناو. ئەو سیرمە لە ملی چارەوێ دەکرێ بۆ ڕاکێشانی عارەبانە 🇮🇷 تسمەی پیوند اسب و گاری

**خاموز** / xamûz/: ☜ **خامۆخ**

**خاموش** / xamûş/: ☜ **خامۆش**

**خامە** / xame/: ناو. ١. چەوری شیر کە بە شێوەی ئاسایی یان بە هۆی کەرەسەی تایبەتەوە لە شیر جوێ دەکرێتەوە ٢. *[ئەدەبی]* قەڵەم؛ قەرەم؛ ئالا؛ پێنووس ‹ئەدای پەشێوی حالات جەستەم/ دوورەن

جـە تـەحریر خامـەی شکەسـتەم «مەولـەوی»› ٣. تووڵ؛ شووڵ ⚑ ١. خامە؛ ٢. قلم ٣. ترکه

**خامەک / xamek/**: ناو. قەنەوز؛ خـام؛ پارچەیـەکی بنەوشی ئاماڵسووره لە ڕەنگـی ئەرخـەوان دەکـا ‹چارەکەی خامەک ئەکاتە کۆڵی/ خرخاڵ مەچـەکی چەشنی سەهۆڵی «قانع»› ⚑ قناویز

**خامەکی / xamekî/**: ناوەڵناو. بە ڕەنگی خامەک ⚑ به رنگ قناویز

**خامینە / xamîne/**: نـاو. کاڵـەی چـەرمی خـاو ⚑ پاتابه از چرم خام

**خان / xan/**: ناو. ١. میرمەزن؛ بـەگ؛ ئاغـا؛ سـان؛ نازناوی دەسەڵاتداران و سـەرەک هـۆزان ‹هەڵـۆ خـان ئـەردەڵان› ٢. خـوان؛ کێـڕی نـاو لوولـەی چەکی گـەرم ٣. کاروانسـەرا ⚑ ١. خـان ٢. خـان تفنگ ٣. کاروانسرا

**خانباجی / xanbacî/**: ناو. شووخوشـک؛ خوشـکی مێرد ⚑ خواهر شوهر

**خانچی / xançî/**: ناو. کاروانسەرادار ⚑ کاروانسرادار

**خانخان / xan xan/**: ناوەڵناو/ ناوەڵکار. خانەـ خانە؛ چاوەـچاوە ⚑ شطرنجی

**خانخانـەکێ / xanxanekê/**: نـاو. حوکمـــەتی سەرانهۆز ⚑ خانخانی

**خاندوک / xanduk/**: ناو. بنی گیایەکە ⚑ ریشـەی گیاهی است

**خانک / xanik/**: ناو. ١. پنە؛ تەختەیەکە ئەنگوتکی لە سەر پان دەکەنەوە ٢. زەمیل؛ زەنبیلە؛ سـەلە ٣. خانوو؛ ماڵ ⚑ ١. تختەای که چونه را بر آن پهن کنند ٢. زنبیل ٣. خانه؛ سرا

**خانگ / xanig/**: نـاو. ماڵ؛ خانوو؛ خانـک ⚑ خانـه؛ سرا

**خانگار / xangar/**: ناوەڵناو. لە بـەر پـیری لـە کـار کەوتە و خانەنشین ⚑ خانەنشین (پیر)

**خانم / xanim/**: نـاو. خـاتوون؛ دادە؛ وشـەی ڕێـز گرتن بۆ ژن ⚑ خانُم

**خانمباز / xanimbaz/**: ☜. ژنباز

**خانمبازی / xanimbazî/**: ☜ ژنبازی

**خانمبی / xanimbî/**: ناو. لەرزانە؛ خشڵێکی سەری ژنانە ⚑ زیوری زنانه

**خانوچکە / xanuçke/**: ناو. خانوولـە: ١. ماڵـۆکەی لە خۆڵ کە منداڵان لە گەمەدا سازی دەکـەن ٢. ماڵی گچکە ⚑ ١. خانەی گلی کودکانـه ٢. خانـەی کوچک

**خانومان / xan û man/**: ناوەڵناو. شـۆخ و شـەنگ؛ جوان و دلگر ⚑ شوخ و شنگ

**خانۆک / xanok/**: ☜ خانە[١]ـ٣

**خانو / xanû/**: ناو. ماڵ؛ یانە؛ خانگ؛ خانک؛ یانی؛ خانی؛ خانێ؛ هوونە؛ کێ؛ کەی؛ کەل؛ مـار؛ کیـە؛ جەوسـە؛ جێگـەی نیشـتەجێ بـوون و ژیـان و حەسانەوە ‹ئەمشەو لە خانووی ئێمـەدا دانیشـە› ⚑ خانه

**خانوبەرە / xanûbere/**: نـاو. خـانووی گـەورە ⚑ ساختمان

**خانوت / xanût/**: ناو. ١. جۆلا ٢. جۆلایی؛ کـاری جۆلا ⚑ ١. جولا ٢. جولایی

**خانولە / xanûle/**: ☜ خانوچکە

**خانە[١] / xane/**: نـاو. ١. خانوو؛ ماڵ ٢. خەتدراوی چوارسـووچ ٣. خـان؛ خانـک؛ خـانۆک؛ چـاوە؛ سیللوول ⚑ ١. خانە ٢. چهارگوشه؛ مربع ٣. سلول

**خانە ـ[٢]**: پێشوشـە. یانە ‹راوەڕووتە و خانەبگیر/ گرمەی تۆپە و قرمەی شێستتیر «هێمن»› ⚑ خانەـ

**ـ خانە[٣]**: پاشەوشـە. ١. یانـە؛ جێگـەی جێبـەجێ کردنی کارێ یـان دامـەزرانی شـتێ ‹قاوەخانـە؛ کتێبخانە؛ بەندیخانە› ٢. خاوەن خان ‹چوارخانە› ⚑ ١و٢. ـ خانه

**خانەبا / xaneba/**: ناو. ١. خامبا؛ دۆخی ئەسـتوور بوونی کـەم ٢. *[کنایه]* جوولـە و بـزاوی سـەبری

ئەندام ۱. ورم اندک ۲. حرکت آرام اندام

**خانەباخ** / xanebax/: ناو. خانەباغ؛ خانووی چێکراو لە ناو باخ خانەباغ

**خانەباغ** / xanebağ/: ☜ **خانەباخ**

**خانەبگیر** / xaneb(i)gîr/: ئاوەڵناو. لە ماڵە خۆدا یەخسیر کراو ‹ڕاوەڕووتە و خانەبگیر/ گرمەی تۆپە و قرمەی شێستتیر «هێمن»› محبوس خانگی

**خانەبەکۆڵ** / xanebekoł/: ئاوەڵناو. ماڵ بەکۆڵ؛ ماڵ بەشان؛ ماڵ لە سەر شان؛ هەڵوەدا؛ عەودال؛ عەبداڵ؛ ڕەهندە؛ لانەواز؛ ڕیتاڵ؛ ڕەبەن؛ بێماڵ و حاڵ خانەبدوش

**خانەبێزار** / xanebêzar/: ئاوەڵناو. خانەبێز؛ وەڕەز لە ماڵە خۆ از خانە فراری

**خانە ـ خانە** / xane xane/: ☜ **خان ـ خان**

**خانەخراپ** / xanex(i)rap/: ئاوەڵناو. ۱. ماڵوێران ۲. *[کنایە]* بێبەخت و کڵۆڵ ۱. خانەخراب ۲. بدشانس

**خانەخوا** / xanex(i)wa/: ناو. خاوەنماڵ صاحبخانە

**خانەخوێ** / xanex(i)wê/: ناو. خانەخوێگ؛ خاوەنماڵ (زۆرتر ماڵی گەورە و بەمیوان) صاحبخانە

**خانەخوێگ** / xanex(i)wêg/: ☜ **خانەخوێ**

**خانەخەرا** / xanexera/: ئاوەڵناو. ماڵوێران؛ ماڵکاول؛ یانەوێران؛ ماڵخەراب ‹ئەی برادەر! خانەوێرانی جودایی بۆ وەفایی/ وەک وەفایی ئەی جودایی یا خودا خانەت خەرا بێ! «وەفایی»› خانەخراب

**خانەدان** / xanedan/: ناو. ۱. ماڵی گەورەی بەمیوان ۲. *[کنایە]* نەجیمزادە ۱. خانەی بزرگ پُرمهمان ۲. نجیبزادە

**خانەزا** / xaneza/: ئاوەڵناو. خانەزاد؛ خانەزاو؛ خانەزای؛ دەرکەزا؛ منداڵی کارەکەر یان نۆکەر کە لە ماڵی ئاغادا لە دایک بووبێ ‹شکاری وەحشییان بەس دەستەمۆ کەن/ نەوەک بەر بێ شکاری خانەزاتان «نالی»› خانەزاد

**خانەزاد** / xanezad/: ☜ **خانەزا**

**خانەزاو** / xanezaw/: ☜ **خانەزا**

**خانەزای** / xanezay/: ☜ **خانەزا**

**خانەژووران** / xanejûran/: ئاوەڵناو. جەنگەی تۆف و سەرما و سۆڵ کە خەڵک لە ژووری دەخزن ‹ئەوڕۆ خانەژوورانە و وەختی چوونە دەر نییە› موسم سرمای سخت کە مردم را خانەنشین می‌کند

**خانەژوورە** / xanejûre/: سارستە. خانەکولانە؛ وشەی بانگ کردنی مریشک کە بچنە کولانەوە جاجا؛ کلمەی راندن مرغ بە لانەاش

**خانەشاری** / xaneşarî/: ئاوەڵناو. دەسبەسەر لە ماڵەخۆیدا در حصر

**خانەقا** / xaneqa/: ناو. خانەگا؛ تەکیە؛ سۆفیگە؛ دەروێشدان خانقاە

**خانەکولانە** / xanekulane/: ☜ **خانەژوورە**

**خانەکی** / xanekî/: ئاوەڵناو. ماڵی؛ کەوی خانگی؛ اهلی

**خانەگا** / xanega/: ☜ **خانەقا**

**خانەگومان** / xaneguman/: ئاوەڵناو. دڵپیس (ژن و شوو لە ئاستی یەک). هەروەها: **خانەگومانی** بدگمان (بە همسر)

**خانەمیری** / xanemîrî/: ناو. ۱. جۆرێ ترێ ۲. هەوایەکی گۆرانی کوردی ۳. هەڵپەڕکێیەکی کوردی ۱. نوعی انگور ۲. از آهنگ‌های کُردی ۳. از رقص‌های کُردی

**خانەنشین** / xanen(i)şîn/: ئاوەڵناو. ۱. گردەنشین؛ ناچار بە مانەوە لە ماڵ، لە بەر پیری یان نەخۆشی یان بێکاری ۲. وەنیشتە؛ کارکەنار ۳. دەسبەسەر لە ماڵی خۆیدا ۱. افتادە و خانەنشین ۲. بازنشستە

٣. در حصر

**خانەنشینی** /xanen(i)şînî/: نــاو. کارکـــەناری؛ وەنیشتەیی؛ ١. بـارودۆخ یـان چۆنیـەتی درێـژە نەدان بە کارێک بەپێی قـانوون و بـە وەرگـرتنی ماف و مـز بـۆ پاشمـاوەی تەمـەن ٢. مووچـەی وەنیشتەیی بەپێی قانوون ▣ ١و٢. بازنشستگی

**خانەوادە** / xanewade/: ناو. ١. ماڵەگەورە ٢. تیرە و تایفە ٣. بنەماڵە ▣ ١. خانەی ثروتمندان ٢. طایفە ٣. خانوادە

**خانـەوخان** / xanewxan/: نـاو. ١. بانـــەوبان ٢. ماڵەوماڵ ▣ ١. بام بە بام ٢. خانە بە خانە

▣ **خانەوخان کردن**: ١. بانەوبان کردن ٢. ماڵەوماڵ کردن ▣ ١. از بـامی بـە بـام دیگـر پریـدن ٢. از خانەای بە خانەی دیگر رفتن

**خـانی** / xanî/: نـاو. ١. مـاڵ؛ خـانوو ٢. کـانی؛ سەرچاوە ▣ ١. خانە ٢. چشمە

**خانیچۆڵکە** / xanîçołke/: ناو. نـاوی یارییـەکی کچانەیە ▣ از بازی‌های دخترانە

**خانیلکە** / xanîlke/: ناو. جۆرێک یاری کچانە ▣ از بازی‌های دخترانە

**خـانێ** / xanê/: ناو. وشـەی بانـگ کـردنی ژن بـە حورمەتەوە ▣ خطاب محترمانەی خانم‌ها

**خـاو**[1] / xaw/: نـاو. ١. خـەو؛ خـەون ‹یـە خـەیلێ وەختەن لێم نادیارەن/ نە شـەو خـاوم هـەن نـە ڕۆم قەرارەن «بێسارانی»› ٢. جێگەی ماڵات و یەکسم لە زستاندا کە قەڵەو بکرێن ٣. گیا و گوڵێکی زۆر بۆنخـۆش ‹مەنـدۆک و خـاو و کـەما، لـە نـەرمان و نەستەما/ بە سروە هاتنە سەمـا، وەیشـوومە و سـەرما نـەما «هـێمن»› ٤. پارچـە گۆشـتێکە لـە نـاو ڕیخۆڵەدا، دەبرژێندرێ ٥. پرزەی شاڵ و قاڵی ▣ ١. خواب ٢. جای پروردن پرواری ٣. گل گیاهی بسیار خوشبو ۴. قطعەای گوشت در رودەی پستاندار ۵. پُـرز شال و قالی

▣ **خاو بەستن**: *[کینایە]* فریـو دان ‹وریـا بـە خـاوت نەبەستێ!› ▣ فریب دادن

**خاو شکاندن**: جـەمامی شـکاندن: ١. ڕاهێنـانی وەرزا بۆ جووت کردن لە ئەوەڵـی بـەهاردا بـە چەند هێڵ جـووت پـێ کـردن ٢. دەرکـردنی مـاڵات لـە سـەرەتای بـەهاردا، بـۆ ماوەیـەکی کورت و هێنانەوەیان بۆ ماڵ ▣ ١. آمـادە کـردن گاو برای شُخم ٢. بە صحرا بردن حیوانات اهلی در آغاز بهار برای مدت کوتاە و بازگرداندنشان

**خاو**[2]: ئاوەڵناو. ١. سست و بێ‌هێز ‹خاو و خلیسک› ٢. کـاڵ؛ نـەکوڵاو ٣. کـاڵ؛ نەگەیشـتوو ٤. نەڕێسراو؛ پێچەوانەی گشتەک ‹ڕەشی بەختی من کلـی چاوتـە/ ڕشـتەی حـەیاتم زوڵـفی خاوتـە «پیرەمێرد»› ٥. خۆش نـەکراو ‹هەوریشـمی خـاو؛ چەرمی خـاو› ٦. ئـارام؛ هێـواش ٧. بـە شـێوەی سروشتی و دەسـکاری نـەکراو ‹نـەوتی خـاو› ٨. نەرم؛ بەبێ گرژی ‹قژی خاو› ٩. بێخـۆ؛ بـن‌شـڕ؛ بێ‌بەهرە ‹مەداری توولی ئومێدم خەیاڵی گەردن و زولفە/ بەڵێ سەوداسەری عاشق لە سەر هەودایـەکی خاوە «حەریق»› ▣ ١. سُست؛ بی‌حال ٢. خام؛ نپختە ٣. کال؛ نارس ۴. خام؛ تابیدە ۵. خام؛ عمـل‌نیامـدە ۶. مُلایم؛ آرام ۷. طبیعی؛ فرآوری نشدە ۸. نرم؛ لَخـت ۹. خام؛ بی‌پایە

▣ **خاو بوونەوە**: ١. شل بوونەوەی بادراو ٢. *[کینایە]* شل بوونـەوە لـە کارێـک ٣. *[کینایە]* تـووڕەیی نەمان؛ هێور بوونـەوە ٤. نـەرم بـوون (چـەرمی وشک‌هەڵاتوو لە ئاودا) ▣ ١. تـاب برگشـتن؛ خـام شدن ٢. بی حوصلە شـدن ٣. آرام شـدن ۴. نـرم شدن (چرم خشک)

**خـاو کردنـەوە**: ١. نمانـدنی چـەرم لـە ئـاودا؛ خووسـاندنی چـەرم ٢. بـادراو ڕەواندنـەوە ٣. *[کینایە]* شل‌وول کردن ‹لە دیوەخانی ئاغا، کلپەی سۆبە بە قەڵاشـکاری وشـک، لەشـی پیـاوی خـاو

ئەکردەوە «سوارە»› ٤. هێور کردنەوە؛ قەڵسی و تووڕەیی پێ نەهێشتن ☰ ١. خیساندن چرم ٢. خام کردن تابیده ٣. شُل و لَخت کردن ۴. آرام کردن

**خاوارە / xaware/**: ناو. بێگانە؛ بیانی؛ نامۆ؛ غەوارە ☰ بیگانه

**خاوالی / xawalî/**: ☜ **خەواڵو**

**خاواڵین / xawałîn/**: ☜ **خەواڵو**

**خاوان / xawan/**: چاوگ. ١. مژول بوون؛ سەرقاڵ بوون ٢. خۆ خلافاندن ☰ ١. سرگرم بودن ٢. خود را سرگرم کردن

**خاواندن / xawandin/**: چاوگ. خاوان؛ خافلاندن ☰ سرگرم کردن

**خاوانن / xawanin/**: ☜ **خاواندن**

**خاوانە / xawane/**: ناو. فرێت؛ داوی پۆ لە تەونـدا ☰ پود قالی

**خاوپەڕ / xawpeř/**: ناوەڵناو. نیوەبادراو؛ تەواو بانەدراو ☰ نیم‌تابیده

**خاوخێزان / xawxêzan/**: ☜ **خاووخێزان**

**خاوڕۆن / xawřon/**: ناو. خاوڕوون؛ خاووڕۆن؛ خایەڕۆن؛ هێلکەوڕۆن ☰ نیمرو

**خا و ڕوون / xawřûn/**: ☜ **خا و ڕۆن**

**خاوزان / xawzan/**: ناو. لێکدەرەوەی خەون ☰ مُعَبِّر خواب

**خاوس / xawis/**: ناوەڵناو. خواس؛ پێخواس؛ بێ‌پێڵاو ☰ پا برهنه

**خاوک / xawik/**: ناو. ١. ڕیسێک کە درەنگ باو دەخوا ٢. خاوە؛ بەن و فرێتی پێویستی تەون ☰ ١. رشته‌ای که به سختی تاب می‌خورد ٢. مواد اولیه‌ی قالیبافی

**خاوکان / xawkan/**: ناو. بەنی زۆر بانەدراوی باریک کە دوو تاڵی پێکەوە با دەدەن و دەبێتە دوو لا ‹شیرین تەشی دەڕێسێ خاوکانە یان دوو لایە «بەیت»› ☰ ریس نیم‌تاب

**خاوکەر[١] / xawker/**: ناو. قامێکی زۆر بەناوبانگە ☰ از آوازهای مشهور کُردی

**خاوکەر[٢]**: ناوەڵناو. خاوکەرەوە: ١. پەژیوان‌کەر ٢. چەرمخووسێن ٣. هەڵوەشێنەری ڕیسراو ☰ ١. مُنصرف کننده ٢. خیسانندەی چرم ٣. رشته را پنبه کُننده

**خاوکەرەوە / xawkerewe/**: ☜ **خاوکەر[٢]**

**خاوکێش / xawkêş/**: ناو. [کینایە] پەت‌کێش؛ کاری لێدان و پەت‌پەتی پێ‌کردن ☰ کتک‌کاری

**خاولی / xawlî/**: ناو. خاڤلوو؛ پشتەماڵ؛ مەرحەمە؛ پارچەی نەرم و کولکنی خۆ وشک کردنەوە ☰ حوله

**خاون / xawin/**: ☜ **خاوەن**

**خاونامە / xawname/**: ☜ **خەونامە**

**خاونای / xawnay/**: چاوگ. پەشۆکاندن ☰ آشفته کردن

**خاووخلیچک / xaw û x(i)lîçk/**: ناوەڵناو. خاووخلیسک: ١. شل و وڵ؛ نەبەگە ٢. لیچق و ناخۆش ☰ ١. شُل و وِل ٢. لزج و بدمزه

**خاووخلیسک / xaw û x(i)lîsk/**: ☜ **خاووخلیچك**

**خاووخێزان / xaw û xêzan/**: ناو. خاوخێزان؛ ژن و منداڵ؛ وردە و یەخسیر؛ هەموو خەڵکی ماڵ ‹تریقە و پێکەنینە و چەپڵەڕێزان/ هەموو بەشداری بەزمن خاووخێزان «هێمن»› ☰ اهل و عیال

**خاووڕۆن / xaw û řon/**: ☜ **خاوڕۆن**

**خاوە / xawe/**: ناو. ١. پیتاکی میری ٢. کەرانە؛ مامەڵە پەشیمانی ٣. سەرانە بۆ شەلاتی زۆردار ٤. لکی تازە لە لق ٥. چەرمێکی نەرم کە وەک فرێتێکی قایم، شەنەی داری پێ دروست دەکەن ٦. ☜ **خاوك-٢** ☰ ١. مالیات ٢. جریمه‌ی پشیمانی از معامله ٣. باج سبیل ۴. جوانه‌ی تازه سر زده ۵. نوعی چرم نرم که رشته کنند ۶. ☜ **خاوك-٢**

**خاوەئەستێن** / xawe'estên/: ئاوەڵناو. قۆڵەچماغ؛ شەلاتی؛ ساختەچی ■ شارلاتان

**خاوەخاو**[1] / xawexaw/: ناو. ١. بڕە و کوڵکەی تەون ٢. گیایەکە مەشکەی پێ دەهەنوون ■ ١. کُرک اضافەی قالی ٢. گیاهی است

**خاوەخاو**[2]: ئاوەڵکار. بە سستی؛ بە شەویقی؛ بێ‌لەشانە ‹خاوەخاو قسە دەکا› ■ شُل و بی‌حال

**خاوەخاوکەر** / xawexawker/: ☜ خاویلکە

**خاوەر** / xawer/: ناو. ڕۆژهەلات؛ خۆرهەلات ■ خاور؛ مشرق

**خاوەرزەمین** / xawerzemîn/: ناو. ولاتی ڕۆژهەلاتی ■ مشرق زمین

**خاوەماست** / xawemast/: ☜ خاوەمێ

**خاوەمێ** / xawemê/: ناو. خاوەماست؛ ماستی شلی شیر نەکولاو بۆ مەشکە ■ ماست آبکی مخصوص مشک

**خاوەن** / xawen/: ناو. خاون؛ خاوەند؛ خودان؛ خێو؛ ساحێب ■ خداوند؛ صاحب

⊡ **خاوەن پێداویستی تایبەت**: کەم‌ئەندام ■ معلول

⊡ **بوونە خاوەن**: ١. بە دەست هێنان ٢. دەست کەوتنەوە ‹کتێبەکەتی بردووە، تازە نابێتە خاوەنی› ■ ١. صاحب شدن ٢. بازیافتن

**بە خاوەن کردن**: ١. پێڕاگەیشتن ‹ئەم ولاتە جوان بە خاوەن دەکەن› ٢. پەروەردە کردن ‹نازانن منال بە خاوەن کەن› ٣. گەورە کردن ‹خوشکی گەورەیان بە خاوەنیان ئەکا› ■ ١. اداره کردن ٢. تربیت کردن ٣. بزرگ کردن

**خاوەن‌ئابڕوو** / xawen'abřû/: ئاوەڵناو. شەریف؛ بەشەرەف ■ شریف

**خاوەن‌ئاش** / xawenaş/: ناو. ئاشەوان؛ ئاسیاوان ■ آسیابان

**خاوەن‌باڵ** / xawenbał/: ئاوەڵناو. باڵدار ■ بالدار

**خاوەن‌بەڵێن** / xawenbełên/: ئاوەڵناو. قسەپتەو؛ قسەدروست؛ نەسۆز ■ پایبند به عهد

**خاوەن‌بیر** / xawenbîr/: ئاوەڵناو. بەبیر؛ بیرا ■ هوشمند؛ مُتفکر

**خاوەن‌پایە** / xawenpaye/: ئاوەڵناو. گرە؛ گراگر ■ بُلندپایە

**خاوەن‌پرسە** / xawenpirse/: ئاوەڵناو. ١. پرسەدار؛ ئازیەتبار؛ خاوەن مردوو ٢. ساحێوپرسە؛ بەڕێوەبەری پرسە و سەرەخۆشی ‹خاوەن‌پرسە خەلکەکەی ڕێنوێنی دەکرد› ■ ١و٢. صاحب‌عزا

**خاوەن‌پرشنگ** / xawenpirşing/: ئاوەڵناو. پرشنگدار؛ تیشک‌هاوێژ ■ تابان

**خاوەن‌تۆپیگ** / xawentopîg/: ☜ خاوەن‌مردو

**خاوەن‌تۆپیو** / xawentopîw/: ☜ خاوەن‌مردو

**خاوەن‌چاکە** / xawençake/: ئاوەڵناو. خێرەومەند؛ چاکەکار ■ نیکوکار

**خاوەند** / xawend/: ☜ خاوەن

**خاوەندار** / xawendar/: ئاوەڵناو. بە ساحب ■ دارای صاحب

**خاوەنداری** / xawendarî/: ناو. ١. سەرپەرستی؛ سەرپەرشتی ٢. خاوەندارێتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی خاوەن بوون ■ ١. سرپرستی ٢. مالکیت

**خاوەندارێتی** / xawendarêtî/: ☜ خاوەنداری[2]

**خاوەن‌ڕێز** / xawenřêz/: ئاوەڵناو. ڕێزدار؛ بەڕێز ■ مُحترم

**خاوەن‌زۆر** / xawenzor/: ئاوەڵناو. [مەجاز] بەدەسەلات؛ توانا ■ قدرتمند

**خاوەن‌ژی** / xawenjî/: ناو. ڕوح‌لەبەر؛ ڕوح‌دەبەر؛ زیندەوەر ■ جاندار

**خاوەن‌شکۆ**[1] / xawenş(i)ko/: ناو. نازناوی پاتشایانە ■ لقب پادشاهان

**خاوەن‌شکۆ**[2]: ئاوەڵناو. شکۆمەن ■ شکوهمند

**خاوەن‌فەرمان** / xawenferman/: ئاوەڵناو. ١. دەسەلاتدار ٢. خاوەن‌کار ■ ١. فرمانروا ٢. کارفرما

**خاوەنقەرز / xawenqerz/**: ناو. کەسێ کە قەرزی داوە ≡ بستانکار

**خاوەنکار / xawenkar/**: ناو. ساحێبکار؛ کارفەرما؛ کەسێ کە کار بە کرێکاران دەدا ‹ئەمڕۆ لەگەڵ خاوەنکارەکە دەمەقرەمان لێ پەیدا بوو› ≡ کارفرما؛ صاحبکار

**خاوەنماڵ / xawenmał/**: ناو. ١. خانەخوێ ٢. ساحێبماڵ ≡ ١. میزبان ٢. صاحب خانه

**خاوەنمردگ / xawenmirdig/**: ☜ **خاوەنمردوو**

**خاوەنمردوو / xawenmirdû/**: ئاوەڵناو. [پەلار] خاوەنتۆپیگ؛ خاوەنتۆپیو؛ خاوەنمردگ؛ ساحێومردوو؛ جۆرێ تووک بە واتای ئەی بریا خاوەنەکەی دەمرد ≡ صاحبمُرده

**خاوەنناو / xawennaw/**: ئاوەڵناو. بەناوبانگ؛ بەناوودەنگ ≡ مشهور

**خاوەنواو / xawenwaw/**: ناو. قەرتدار؛ قەردار ≡ طلبکار

**خاوەنودم / xawenwidm/**: ئاوەڵناو. ودمدار؛ ورمێدار ≡ باشگون

**خاوەنهزر / xawenhiz(i)r/**: ئاوەڵناو. تێبین؛ وردەکار؛ بیر ڕووناک ≡ اندیشمند

**خاوی / xawî/**: ناو. ١. شلی ٢. تەنبەڵی ٣. کاڵی؛ نەگەیشتوویی ٤. نەکوڵاوی ≡ ١. شُلی ٢. تنبلی ٣. کالی ٤. ناپختگی

**خاویلکە / xawîlke/**: ئاوەڵناو. خاوەخاوکەر ≡ دیرجُنب

**خاویلکەیی / xawîlkeyî/**: ناو. مرتین؛ شلی؛ سُستی ≡ سُستی

**خاوین / xawîn/**: ئاوەڵناو. زۆربخەو؛ خەو ـ خەو؛ تایبەتمەندی کەسێ کە زۆر دەخەوێ ≡ پُرخواب

**خاوێر / xawêr/**: ناو. بیرەوخەو؛ خەونووچکە؛ خەوەنووچکە؛ دۆخی وەنەوز دان بە دانیشتن یان بە پاوە، بە شێوەیەک کە لە سەر یەک سەر داکەوێ و کەسەکە ڕاچڵەکێ ≡ پینکی

**خاوێر ـ خاوێر / xawêr xawêr/**: ئاوەڵکار. خاوەخاو؛ هێواش ـ هێواش ≡ یواش ـ یواش

**خاوێن[1] / xawên/**: ناو. گیای ژانەدڵ، لە کوردستان زۆرە و بۆ نەخۆشینی بای سوور بەکەڵکە ≡ گیاه دُم روباه

**خاوێن[2]**: ئاوەڵناو. پاک؛ پاقژ؛ تەمیس ≡ پاکیزه

**خاوێنکار / xawênkar/**: ناو. ماڵشتە ≡ نظافتچی

**خاوێنی / xawênî/**: ناو. پاکی؛ پاقژی؛ پاکژی؛ تەمیسی ≡ پاکیزگی

**خایان / xayan/**: چاوگ. غایان؛ ماوە پێچوون ≡ وقت بُردن

**خایاندن / xayandin/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //خایاندت؛ دەخایێنی؛ بخایێنە// خایانن؛ خەیانن؛ غایاندن: ١. پێچوون ٢. خۆ گرتن؛ سەور کردن ≡ ١. وقت بردن ٢. درنگ کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەخایاندن

**خایانن / xayanin/**: ☜ **خایاندن**

**خاین / xayin/**: ئاوەڵناو. خایەن؛ خائین؛ غاین؛ غەیان؛ دوخمان؛ هۆگر بە خەیانەت ≡ خیانتکار

**خایە / xaye/**: ناو. ١. خا؛ هێلکەی مەل ٢. هێلکەگون ‹هەر وەکوو موویی خایە بێخێرە «شێخ ڕەزا»› ≡ ١. تخم پرنده ٢. بیضه

**خایەڕۆن / xayeřon/**: ☜ **خاوڕۆن**

**خایەم / xayem/**: ☜ **خادم**

**خایەمار / xayemar/**: ناو. شەیتانۆکە؛ چاوشەیتانە؛ هێلکەشەیتان ≡ حلزون

**خایەن[1] / xayen/**: ئاوەڵناو. ١. ☜ **خاین** ٢. بێبەخت ≡ ١. ☜ **خاین** ٢. بدشانس

■ **خایەن[2]**: پاشەوشە. ـ خایێن؛ کاتگر ‹درێژخایەن› ≡ زمانبر

**خایەنران / xayenran/**: چاوگ. وە درەنگ کەوتن؛ کاتوسات بردن؛ زەمانێ زۆر تێچوون ≡ بە

تأخیر افتادن

**خایەنراو** / xayenraw/: ئاوەڵناو. وە درەنگ کەوتوو ☰ به تأخیر افتاده

**خایەومایە** / xayewmaye/: ناو. *[مەجاز]* هەرچی هەیە؛ هەس و نییە ☰ هست و نیست

**خایینە** / xayîne/: ناو. خاریز؛ خاوورۆن؛ خۆراکێکە لە ئارد و هێلکە کە بەش ـ بەش دەرۆندا سووری دەکەنەوە و دوایی شەربەت یان دۆشاوی بە سەردا دەکەن ☰ خاگینە

• **خایێن** / xayên-/: ☜ ـ **خایەن**[۲]

**خپ**[۱] / xip/: ئاوەڵناو. *[پەلار]* کڕ و مات؛ بێدەنگ و بزووتن ☰ ساکت و بی‌حرکت

▣ **خپ بون**: ۱. کڕ و بێدەنگ بوون ۲. *[کینایە]* مردن ☰ ۱. ساکت و بی‌حرکت شدن ۲. مُردن

**خپ کردن**: *[پەلار]* بە یەکجاری بێدەنگ کردن؛ کوشتن ☰ کُشتن

**خپ کەوتن**: *[پەلار]* بە یەکجاری بێدەنگ بوون؛ مردن ☰ مُردن

**خپ هەڵاتن**: *[پەلار]* بە یەکجاری لە بزووتن کەوتن ☰ به یکباره از حرکت افتادن

**خپ**[۲]: ئاوەڵکار. ئازا و بەبێ دەنگ و بزووت ‹پەلاماری کە دا بۆ زابتێ/ یەک زللە خپ خستی «گۆران»› ☰ بی‌حرکت

**خپر** / xipr/: ناو. ۱. کار و ڕەوتی کۆڵینەوە ۲. کار و ڕەوتی هەڵکەندن؛ کۆڵین ☰ ۱. کنکاش ۲. حفّاری

**خپشەملە** / xipşem(i)le/: ئاوەڵناو. ۱. ملهوڕ؛ ملئەستوور ۲. *[مەجاز]* زۆردار و لەخۆبایی ☰ ۱. گردن‌کلفت ۲. توانا و مغرور

**خپلاک** / xiplak/: ناو. دەرک و پەنجەرەی شەق و شڕ و لەکارکەوتوو ☰ در و پنجرەی مُستعمل و ازکارافتاده

**خپلە** / xiple/: ئاوەڵناو. ختل؛ کورتەباڵای قەڵەو ☰ چاقالو

**خپە** / x(i)pe/: ناو. کار و ڕەوتی خۆ لە شتێک مات کردن؛ بە دزییەوە دە بەر چاو گرتن ☰ عمل زیر نظر داشتن

▣ **خپە کردن**: خۆ مات کردن لە سووچێک ☰ آرام در گوشه‌ای خزیدن و مراقب بودن

**خت**[۱] / xit/: ناو. ۱. سەرگەرمی ۲. فیکر و زیکر ☰ ۱. سرگرمی ۲. مشغولیت

**خت**[۲]: ئاوەڵناو. ۱. خپ؛ بێدەنگ و جووڵە ۲. بێخۆ و خۆڕایی ☰ ۱. بی‌سر و صدا ۲. بیهوده

**خت**[۳]: دەنگەناو. وشەی دەرکردنی پشیلە ☰ کلمەی راندن گربه

**خت**[۴]: لێل. ← **ختوخاڵی**

**خت پشکەر** / xitpişker/: ئاوەڵناو. *[پەلار]* دڕدوک؛ هەڵقورتێن؛ خۆتێهەڵقوتێن ☰ فضول

**ختتە** / xitte/: ☜ **ختە** ـ۱

**ختخت** / xitxit/: ☜ **ختیلکە**

**ختک** / xit(i)k/: ناو. کتک؛ پشیلە؛ پشی؛ پسیک ☰ گربه

**ختکە** / xitke/: ☜ **ختیلکە**

**ختکی** / xitkî/: ☜ **ختیلکە**

**ختکینە** / xitkîne/: ئاوەڵناو. هانەدەر؛ دنەدەر ☰ مشوّق

**ختکێ** / xitkê/: ☜ **ختیلکە**

**ختل** / xit(i)l/: ☜ **خپلە**

**ختوخاڵ** / xit û xał/: ☜ **خشتوخاڵ**

**ختوخاڵی** / xit û xałî/: ئاوەڵناو. چۆڵوهۆڵ؛ هیچی تێدا ☰ خالی

**ختوورە** / x(i)tûre/: ناو. ۱. بە دڵدا هاتن ‹دڵی ختوورە دەکا› ۲. دڵەڕاوکێ ☰ ۱. خطور ۲. اضطراب

**ختوکە** / x(i)tûke/: ☜ **ختیلکە**

▣ **ختوکە دان**: قدیلکە دان ☰ قلقلک دادن

**ختولکه** / x(i)tûlke/: ☜ **ختیلکه**

**خته** / x(i)te/: ناو. دەنگەناو. ١. ختتە؛ وشەی دەرکردنی پشیلە ‹خانمێ بوو سەرسەری/ دانیشتووە ناو پەنجەری/ کتکەکە هات گۆشت بەری/ عاری هات ختە کەری! «مەسەل»› ٢. ☜ **ختیلکه** ☰ ١. کلمەی راندن گربه ٢. ☜ **ختیلکه**

⊡ **خته دان**: ١. بزواندن؛ دنه دان ٢. قدیلکه دان ☰ ١. تحریک و تشویق کردن ٢. قلقلک دادن

**ختەخت** / x(i)texit/: ناو. چۆنیەتی لێدانی دڵ لە نیگەرانی ☰ تپش قلب از نگرانی

**ختیره** / x(i)tîre/: ناو. بزووت؛ بەیسووس؛ چۆلەچرا ☰ نیمسوز

**ختیک** / x(i)tîk/: ناو. کەمێلە؛ چلمی وشکەوەبوو بە لووتەوە ☰ خلم

**ختیلک** / x(i)tîlik/: ☜ **ختیلکه**

**ختیلکه** / x(i)tîlke/: ناو. ختخت؛ ختکه؛ ختکێ؛ ختکێ؛ ختووکە؛ ختوولکە؛ ختە؛ ختیلک؛ ختیمتی؛ ختێ؛ خدووک؛ خدووکە؛ خدیکە؛ قانەقدی؛ قدیلکە؛ دنەیەکی پێکەنینهێن کە بە هۆی بزواندنی ماسوولکەیەکی نەرمی لەش بە قامک یان شتێکیتر بەدی دێ ☰ قلقلک

**ختیمتی** / x(i)tîm(i)tî/: ☜ **ختیلکه**

**ختێ** / x(i)tê/: ناو. ١. پشیله ٢. ☜ **ختیلکه** ☰ ١. گربه ٢. ☜ **ختیلکه**

**ختێنه** / x(i)têne/: ناو. هان؛ دنه؛ هانه؛ هانە ـ هانە؛ فیت؛ زاخ؛ تور؛ فچک؛ گزک؛ بلووم؛ کاری زیخان؛ هێزان؛ هێژان ☰ تحریک

**خجڵ** / xic(i)ł/: ئاوەڵناو. خەریک ‹بێرۆ بچین! خجڵ چەی؟› ☰ سرگرم؛ مشغول

**خجڵنای** / xiciłnay/: چاوگ. سەرگەرم کردن ☰ مشغول کردن

**خجڵیای** / xiciłyay/: چاوگ. ١. سەرگەرم بوون ‹خجڵیای بە دەرد چەرخ پوڕستەم/ هەرگیز ڕۆی شادی نەوینی وە چەم «سەیدی»› ٢. خەجاڵەت کێشان؛ شەرمەزار بوون ☰ ١. مشغول شدن ٢. خجالت کشیدن

**خچ** / xiç/: ئاوەڵناو. دەرکراو لە یاری ☰ از بازی حذف شده

**خچان** / x(i)çan/: چاوگ. دۆڕان ☰ باختن

**خچاندن** / x(i)çandin/: چاوگ. دۆڕاندن ☰ باختن

**خچ ـ خچ** / xiç xiç/: دەنگەناو. خچۆ ـ خچۆ؛ وەحا ـ وەحا؛ وشەی دەرکردنی ڕەشەوڵاغ ☰ واژەی راندن گاو و گاومیش

**خچۆ ـ خچۆ** / x(i)ço x(i)ço/: ☜ **خچ ـ خچ**

**خدام** / x(i)dam/: ناو. خدامە؛ کارەکەر؛ کڵفەت؛ جێری ☰ کُلفَت

**خدامه** / x(i)dame/: ☜ **خدام**

**خدرونەلیاس** / xidr û 'elyas/: ☜ **خدرەلیاس**

**خدرەلیاس** / xidrelyas/: ناو. خدرونەلیاس؛ شازدەی مانگی ڕەشەمە ‹خدرەلیاس سەرما خەلاس! «مەسەل»› ☰ شانزدهم اسفند

**خدۆک** / x(i)dok/: ناو. نەزیلە؛ کورتەچیرۆک ☰ داستان کوتاه

**خدو** / x(i)dû/: ناو. خووی سرشتی ☰ غریزه

**خدوک** / x(i)dûk/: ناو. ١. ☜ **ختیلکه** ٢. ئۆناق؛ کوڵی گریان ☰ ١. ☜ **ختیلکه** ٢. بُغض

⊡ **خدوک هەستان**: کوڵی گریان هەستان ‹لەو هەموو قسە تاڵە بیستی، زۆری خدووک هەستابوو› ☰ بُغض کردن

**خدوکه** / x(i)dûke/: ☜ **ختیلکه**

**خده** / x(i)de/: ناو. خدیک؛ خدێ؛ خەدە؛ خوو؛ ڕەوشت؛ ئاکار ☰ خوُ؛ روش

**خدەپەسند** / x(i)depesind/: ئاوەڵناو. خۆشخوو؛ ئاکارباش؛ دژی بەدخوو ☰ خوش‌اخلاق؛ خوشخو

**خدیک** / x(i)dîk/: ☜ **خده**

**خدیکه** / x(i)dîke/: ☜ **ختیلکه**

**خدێ / x(i)dê/:** ☜ **خدە**

**خرا / x(i)ra/:** ☜ **خراپ**

**خراب / x(i)rab/:** ☜ **خراپ**

**خرابە / x(i)rabe/:** ئاوەڵناو. قەترمە؛ وێران؛ خاپوور ⚑ ویران

**خراپ / x(i)rap/:** ئاوەڵناو. خـراب؛ خـراو؛ خـرا: ١. وێران؛ تێکچوو ٢. ناشیرین ٣. لەکارکەوتـە ⚑ ١. ویران ٢. زشت و ناپسند ٣. ازکارافتاده

**خراپکار / x(i)rapkar/:** ☜ **نابەکار**

**خراپۆچکە / x(i)rapoçke/:** ئاوەڵـناو. بـێ کەڵـک؛ کەمبایەخ ⚑ بی‌ارزش

**خراپە / x(i)rape/:** نـاو. خراوە؛ خەراوە: ١. کـاری ناشـیرین؛ کـردەی نـەباش ٢. قاحبـە؛ جنـدە؛ سۆزمانی ٣. ڕێگر؛ چەتە؛ گۆران ⚑ ١. کار زشت و ناپسند؛ معصیت ٢. فاحشه ٣. راهزن

**خراپـــەخواز / x(i)rapex(i)waz/:** ئاوەڵـــــناو. چەپخووس ⚑ بدخواه

**خراپـەکار / x(i)rapekar/:** ئاوەڵــناو. خراپەکــەر؛ ئاکارناپەسەند ⚑ بدکار

**خراپەکەر / x(i)rapeker/:** ☜ **خراپەکار**

**خراپەویست / x(i)rapewîst/:** ئاوەڵناو. بـەدخواز ⚑ بدخواه

**خراپی / x(i)rapî/:** ناو. خراوی؛ خەراپی؛ نەباشـی؛ بەدفەڕی؛ بەدکاری ⚑ بدی

**خرار / x(i)rar/:** ناو. خەشە؛ تێر و جەواڵی لە مـوو ⚑ جوال موین

**خرارک / x(i)rarik/:** ناو. خراری چکۆڵـە ⚑ جـوال موین کوچک

**خراش / x(i)raş/:** نـاو. ڕووش؛ ڕووشـە؛ خاشــە ⚑ خراش

**خرامان[1] / x(i)raman/:** ناو. قەرەبووی گـومبـوو ⚑ غرامت

**خرامان[2]:** ☜ **خەرامان[2]**

**خـران / x(i)ran/:** چـاوگ. تێنەپـەڕ. نادیـار. //خـــرای؛ دەخرێی؛ بخرێ// خریان: ١. هاوێژران ‹گەرچی بۆ خۆی خرایە چاڵی گۆڕ/ شوێنەواری بەنرخی مـاوە لـە گۆڕ «هێمن»› ٢. داندران ‹بار خرایـە سـەر پشـتی بارەبەر› ⚑ ١. انداخته شدن ٢. گذاشته شدن

■ ئاوەڵـــناوی بــەرکاری: خـــراو/ چـاوگی نـەرێنی: نەخران

**خـراو[1] / x(i)raw/:** نـاو. جنێـــو؛ جـــوێن؛ دژوون؛ دژوێن؛ سخێف ⚑ دشنام

**خراو[2]:** ئاوەڵناو. خراب؛ خراپ ⚑ خراب

**خراوبـو / x(i)rawbû/:** ئاوەڵـناو. لـە نـاوچوو؛ بـە فێڕۆچوو ⚑ تلف

**خراوە / x(i)rawe/:** نـاو. ١. وێرانە ٢. خراپـە ⚑ ١. ویرانه ٢. کار زشت و ناپسند

**خراوەکێڵـی / x(i)rawekêlî/:** نـــاو. جەڵــــەبی؛ بەدجنسی ⚑ بدجنسی

**خراوی / x(i)rawî/:** ☜ **خراپی**

**خربرۆشـک / xirb(i)roşk/:** نـــاو. خەبەرۆشـــک؛ ئەفسانە ⚑ افسانه

**خرپ[1] / xirp/:** ناو. خیزەڵان؛ زیخگە ⚑ شنزار

**خرپ[2]:** ئاوەڵکار. ئـازا؛ زوو ‹هـەر سـەری نایـە سـەر سەرین، خرپ خەوی لێ‌کەوت!› ⚑ سریع

**خرپف / xirpif/:** دەنگەناو. ڤزە؛ پرخە؛ خرپـۆق ⚑ خُرناسه

**خـرپن / xirpin/:** ئاوەڵــناو. خرپنــە؛ خرپنۆکـــە؛ خەپــەرە؛ خەپەڵـە؛ قەڵـەوی کـورت؛ چکۆڵـەی تێرگۆشت ‹بەرخی خرپن› ⚑ چاق‌چلّه

**خرپنۆکە / xirp(i)noke/:** ☜ **خرپن**

**خرپنە / xirp(i)ne/:** ☜ **خرپن**

**خرپوق / xirpuq/:** ☜ **خرپۆق**

**خرپۆق / xirpoq/:** دەنگەناو. خرپوق؛ ڤـزە؛ خرپـف؛ پرخە؛ پرخەپرخ ⚑ خُرناسه

**خرپە[1] / xirpe/:** ناو. زبارە؛ هەرەوەزی ⚑ تعاونی

**خرپە**[٢]: دەنگەناو. ١. پرخە؛ خڕپوق ٢. دەنگی پـای نادیارێک ☰ ١. خُرناسە ٢. صدای پا

**خرپەک** / xirpek/: نـاو. دەغلـی تـەنک؛ دەغلـی لاسک باریـک کـە لـە شـوێنی کـڕاڵ دەڕوێ ☰ دانەی ضعیف

**خرت**[١] / xirt/: ناو. ١. ئامرازی خـەڕاتی ٢. کـووری سێ ساڵانە و گەورەتر ☰ ١. ابزار خرّاطی ٢. شـاک سە سالە

**خـرت**[٢]: ئاوەڵـناو. ١. خـڕ؛ گرۆڤـەر ٢. گرۆڤـەری لوولەیی؛ خڕی لوولەیی ☰ ١. کروی ٢. استوانەای

**خرت**[٣]: لێل. ← خرتوخۆڵ/ خرتوخاڵ/ خرتوپرت

**خرتک** / xirtik/: نـاو. ١. گرتکەگۆشـت؛ پارچـەی پـڕچنگ لـە گۆشـت ٢. پاشـەڕۆک ٣. خرکانـە؛ جۆرێ زیپکە لە سەری منـاڵ دێ ٤. جومگـە ٥. خرتک؛ تەگـەرە؛ پێچـک ٦. خرچـە؛ گنـدۆرەی کاڵ ☰ ١. قطعەی گوشت ٢. پساچین ٣. جوش سـر نوزاد ۴. مفصل ۵. چرخ؛ تایر ۶. خربُزەی کال

**خرتکە** / xirt(i)ke/: ناو. جومگەی دەست و پـا ☰ مفصل دست و پا

**خرتکەوپرتکـە** / xirtke w pirtke/: نـــاو. خرکەوپرکە؛ قـاپوقـاپۆڕ؛ خروپـری نـاو مـاڵ ☰ خرت‌وپرت؛ اثاثیه

**خرتگ** / xirtig/: ☜ خرتە[١]

**خرتل** / xirtil/: نـاو. ١. خڕتک؛ خڕکەبەرد ٢. ☜ خەرتەل ـ١ ☰ ١. قلوە سنگ ٢. ☜ خەرتەل ـ١

**خرتنایۆ** / xirtnayo/: چاوگ. خڕ کردنەوە ☰ گـرد کردن

**خرتوپرت** / xirt û pirt/: ناو. ١. خرتەوپرتـە؛ وردە حاجەتی کەم‌بایی ٢. ورتەورت؛ دڵـەڕاوکێ ‹دڵـم کەوتە خرت‌وپرت› ☰ ١. خرت و پرت ٢. دلهره

**خرتوخاڵ** / xirt û xał/: نـاو. تلتە؛ تلفە؛ بن‌خاڵـە؛ خەوش و مـاکی ناتێکـەڵ لـە بـنی تراوێکـدا ☰ تەنشست

**خرتومرت** / xirt û mirt/: ئاوەڵناو. تێرگۆشتی دڵگر و جوان ☰ زیبای تُپُلی

**خرتۆڵ**[١] / xirtoł/: ناو. حەشامەت؛ ئاپۆرە ☰ انبوهی مردم

**خرتـۆڵ**[٢]: ئاوەڵـناو. خرتۆڵـە؛ خرتەلانـە؛ خرتەڵـە؛ خرتیلە؛ خرتیلانە؛ خڕکەلانە؛ خڕکەڵە؛ خڕیلانـە؛ خڕیلە؛ گرد و خڕی بچووک ☰ گرد و کوچک

**خرتۆڵە** / xirtołe/: ☜ خرتۆڵ[٢]

**خرتونک** / xirtûnik/: ☜ خرتە[١]

**خرتە**[١] / xirte/: ناو. ١. کڕۆژنە؛ کڕۆژە؛ خرتوونـک؛ خرتگ؛ خرینـگ؛ چەشـنێک شـانەی پێوەنـدی، نەرمتر لە ئێسک کە سەرچاوەی شـانەی ئێسـکە ٢. کۆدە؛ زەوی ڕەق لە کێلاندا ☰ ١. غضـروف ٢. زمین سخت در شخم زدن

**خرتـە**[٢]: دەنگەناو. دەنگـی بزووتنـەوەی گیانـداری بچووک ☰ صدای حرکت جاندار کوچک

**خرتەخرت**[١] / xirtexirt/: ئاوەڵکار. هێواش هێـواش و بـە هـەنگاوی ورد ‹کەوفتـە ڕێگـە خرتـەخرت/ شیریت شیرین، وردەورد «عەلیڕەزا موحەممەدیان»› ☰ آهسته ـ آهسته

**خرتەخرت**[٢]: دەنگەناو. خرتە؛ دەنگـی بزووتنـەوەی گیاندار لە ناو کوندا ☰ صدای جانور در سوراخش

**خرتەک** / xirtek/: ناو. خرتک؛ پێچکە؛ تەگـەرە ☰ چرخ؛ تایر

**خرتەگل** / xirtegil/: ناو. ١. گلار؛ خلـۆر ٢. ڕەوتی هەڵەنگووتن؛ ساتمە بردن؛ تل دان ☰ ١. غلـت ٢. تلوتلو

**خرتەل** / xirtel/: ☜ خەرتەل ـ١

**خرتەلانە** / xirtełane/: ☜ خرتۆڵ[٢]

**خرتەڵە** / xirtełe/: ☜ خرتۆڵ[٢]

**خرتەوپرتە** / xirte w pirte/: ☜ خرت‌وپرت ـ١

**خرتـی** / xirtî/: ئاوەڵـناو. تـەژەی مـلـقـەوی ☰ گردن‌کلفت

**خرتیلانە** / xirtîlane/: ☜ **خرتۆل**[٢]

**خرتیلە** / xirtîle/: ☜ **خرتۆل**[٢]

**خرتیوپرتی** / xirtîwpirtî/: ناو. سرتوهوڕ؛ سرتە و پچە ☰ گفتگوی درگوشی و محرمانە

**خرجین** / xircîn/: دەنگەناو. ١. دەنگی دار شکاندن ٢. دەنگی فڕینی کلۆ بە کۆمەڵ ☰ ١. صدای شکستن هیزم ٢. صدای پریدن دستەجمعی ملخها

**خرچ**[١] / xirç/: ناو. ١. خرچە؛ گندۆرەی تازە و پێنەگەیشتوو ٢. ورچ؛ حەش ☰ ١. خربُزەی کال و نارسیده ٢. خرس

**خرچ**[٢]: ئاوەڵناو. کرچ؛ کاڵ؛ نەگەیشتوو ☰ کال

**خرچان** / xirçan/: چاوگ. ١. خچان؛ دۆڕان ٢. خێچان؛ ئەنگاوتن ☰ ١. باختن ٢. به هدف زدن

**خرچوهۆڕ** / xirç û hoř/: دەنگەناو. دەنگی داکرۆژتنی شتی تورت ‹خرچوهۆڕی خەیار خواردنی دێ› ☰ کلوچ ـ کلوچ

**خرچە**[١] / xirçe/: ناو. ١. عەنجووڕ؛ بەچکەگندۆرە ٢. ئامرازێکە لە عەڕابەدا کە سەری مازەی تێ دەخرێ ☰ ١. خربُزەی کال ٢. وسیلەای در گاری

**خرچە**[٢]: دەنگەناو. ١. کرتەی داکرۆژتن ٢. دەنگی کانزا ‹خرچەی خەنجەران نە دڵ تا دەستە/ باهووی دلێران شکەستە و بەستە «شانامەی کوردی»› ☰ ١. کلوچ ٢. چکاچک

**خرخاڵ** / xirxał/: ناو. خرخاڵە؛ خلخاڵ؛ پامۆرە؛ پامووره؛ خشڵێ بازنەیی لە کانزای گران، کە ژنان دەیکەنە مەچەکی پایانەوە ☰ خلخال

**خرخاڵە** / xirxałe/: ☜ **خرخاڵ**

**خرخاڵەدار** / xirxałedar/: ئاوەڵناو. خرخاڵەدار؛ بە خرخاڵە ☰ دارای خلخال

**خرخندۆک** / xirxindok/: ناو. کیفۆک؛ پیفۆک؛ بنی گیایەکە دەخورێ ☰ ریشەی خوردنی گیاهی

**خرز** / xirz/: ناو. ١. گەرا؛ تۆمی وردی هێشتا نەگووراوی مێروو ٢. گەرای ماسی ☰ ١. تخم ریز حشرات ٢. تخم ماهی

**خرزەک** / xirzek/: ناو. خرووسەک؛ خورۆسەک؛ خرووزەک؛ خورووزەک؛ خەندخەندوک؛ لارنژیت؛ نەخۆشییەکی سپیەڵاکە کۆخەی وشک و سەختی لەگەڵدایە ☰ بیماری خروسک

**خرس**[١] / xirs/: ناو. ١. ورچ؛ هرس؛ هرچ؛ حش؛ حەش؛ هەشە ٢. یەکانە؛ بەرازی نێر ٣. سیحر؛ جادوو ☰ ١. خرس ٢. گُراز نر ٣. جادو

**خرس**[٢]: ئاوەڵناو. *[پلار]* خرش: ١. تەمەڵ؛ تەوەزەل ٢. لاسار و گوێنەبیس ٣. بێبەر؛ تایبەتمەندی داری میوە کە بەر نادا ☰ ١. تنبل ٢. لجوج ٣. بی ثمر (درخت میوە)

**خرسەک** / xirsek/: ناو. خەرسەک: ١. مافوورەی تیسکدرێژ ٢. *[پلار]* کولێرەی ئەستوور ☰ ١. قالی خرسک ٢. گردەنان قطور

**خرش** / xirş/: ئاوەڵناو. ١. قەڵب؛ زڕ؛ بەدەڵ ٢. نەزۆک ٣. ☜ **خرس**[٢] ☰ ١. بدلی ٢. نازا ٣. ☜ **خرس**[٢]

**خرشک** / xirişk/: ناو. کرمی میوەی وشککراو ☰ کرم خشکبار

**خرشی** / xirşî/: ناو. نەزۆکی؛ نەزایی؛ ئەستێوری ☰ نازایی

**خرکانە** / xirkane/: ناو. خرتک؛ خەرکان؛ خەرکانە؛ جۆرێ زیپکە کە لە سەر و ڕووی منالی ساوا دێت ☰ جوش سر و صورت نوزاد

**خرکەوپرکە** / xirke w piřke/: ☜ **خرتکەوپرتکە**

**خرمان** / xirman/: ناو. ١. ☜ **خەرمان ـ١** ٢. بە سەر یەکدا کراوی زۆر لە میوە ☰ ١. ☜ **خەرمان ـ١** ٢. توده و انبوه میوه

**خرماندن** / xirmandin/: چاوگ. کرماندن؛ کرۆتانن؛ دەنگ لە ددان هاتن کاتی خواردنی شتی تورت ☰ کروچیدن

**خرمانلۆغە** / xirmanloğe/: ☜ **خەرمانلۆخانە**

**خرمچو** / xirimçû/: ناو. خرمچوون؛ چوار پەل (مالات) ☰ چهار دست و پا (احشام)

▣ **خرمچو کردن**: ١. بەستنی چوار پەلی مالات بۆ سەر برین ‹گوریسێک بێنن خرمچووی کەن دەنا ناکەوێ› ٢. /پلار/ چوارپەل بەستنەوە ‹هەر کە گەیشتە بەرەوە، گرتیان و خرمچوویان کرد› ☰ ١. بستن چهار دست و پای حیوان جهت سر بریدن ٢. چهار دست و پا را بستن

**خرمچوون** / xirimçûn/: ☜ **خرمچو**

**خرمژن** / x(i)rimjin/: دەنگەناو. دەنگی لەرانەوەی کرمەک و بەرموور و ژێرچەنە ☰ صدای زیورآلات

**خرمنای** / xi(i)rmnay/: چاوگ. کرماندن ☰ کروچیدن

**خرموهۆڕ** / xirm û hoř/: دەنگەناو. ١. دەنگی پای ئەسپان و ... ٢. دەنگی خشڵ و زەنبەر ☰ ١. صدای سُم اسبان ٢. صدای به هم خوردن زیورآلات

**خرموتک** / xirmûtik/: ناو. خرمووتە؛ خرمووچک؛ کرۆژنە؛ کرکرە ☰ غضروف

**خرموتە** / xirmûte/: ☜ **خرموتك**

**خرموچک** / xirmûçik/: ☜ **خرموتك**

**خرموش** / xirmûş/: ناو. خرمووشک؛ خرمووشەک؛ چنگورک؛ چنگاڵی پشیلە و درندە ☰ چنگال درنده

**خرموشک** / xirmûş(i)k/: ☜ **خرموش**

**خرموشەک** / xirmûşek/: ☜ **خرموش**

**خرمە** / xirme/: دەنگەناو. ١. ☜ **خرنگە** ٢. دەنگی کرۆژتن ☰ ١. ☜ **خرنگە** ٢. صدای کلوچیدن

**خرمەخرم** / xirmexirm/: ئاوەڵکار. بە خرمەی لەسەر یەکەوە ‹کەروێشکەکە خرمەخرم هەموو گێزەرەکەی خوارد› ☰ صدای پیاپی کلوچیدن

**خرمیای** / xirmyay/: ☜ **کرمان**

**خرناق** / xirnaq/: ناو. لووت؛ کەپۆ ☰ بینی

**خرندال** / x(i)rindal/: ناو. گیایەکە ئەیخۆن ☰ گیاهی خوراکی

**خرندۆل** / x(i)rindol/: ناو. فرۆ؛ خرۆندول؛ خرۆندوڵ؛ خرەندول؛ خرەندۆڵ؛ فرچک؛ فریشک؛ ژەک ☰ آغوز

**خرنگ**[1] / x(i)ring/: ئاوەڵناو. جوان و لەبەردڵان ☰ زیبا

**خرنگ**[2]: ☜ **خرنگە**

**خرنگوهۆڕ** / x(i)rng û hoř/: ☜ **خرنگە**

**خرنگە** / x(i)ringe/: دەنگەناو. خرمە؛ خرنگ؛ خرنگوهۆڕ؛ خرینگە؛ دەنگی خشڵ و زەنبەر ☰ صدای زیورآلات

**خرنگەخرنگ** / x(i)ringex(i)ring/: دەنگەناو. خرنگەی زۆر ☰ صدای پیاپی بە هم خوردن زیورآلات

**خروشاندن** / x(i)ruşandin/: ☜ **خرۆشاندن**

**خروێکە** / xirwêke/: ☜ **خروێلکە**

**خروێلکە** / xirwêlke/: ناو. خوروێلکە؛ خروێکە؛ خورووکە؛ خروێلە؛ خروێنکە؛ خرووکە؛ خوری؛ خوریک؛ خوریکە؛ خوریلە؛ ئاولە ☰ آبله

**خروێلە** / xirwêle/: ☜ **خروێلکە**

**خروێنکە** / xirwênke/: ☜ **خروێلکە**

**خرۆش** / x(i)roş/: ناو. خورۆش؛ هاوار؛ هەرا و هوریا ‹بە نەشئەی بادەی نازی خۆت سەرخۆش/ مەیخانەی عەشقی خستۆتە خرۆش «پیرەمێرد»› ☰ خروش

**خرۆشان** / x(i)roşan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //خرۆشای؛ دەخرۆشێی؛ بخرۆشە// خورۆشان؛ خرۆشیان؛ مرۆشیان؛ گوڕان: ١. گوڕاندن؛ بە قەو و زۆرتر تووڕەییەوە هاوار کردن ٢. /مەجاز/ گرماندن؛ گرمنەی؛ گرمنای؛ گورمین ☰ ١و٢. خروشیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: خرۆشاو/ چاوگی نەرێنی: نەخرۆشان

**خرۆشـــاندن** / x(i)roşandin/: چـــاوگ. تێـــەپ. //خرۆشاندت؛ دەخرۆشێنی؛ بخرۆشێنە// خرۆشـانن؛ خورڕۆشاندن؛ خروشـاندن؛ خسـتنە خرۆشـەوە ☰ خروشاندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەخرۆشاندن

**خرۆشانن** / x(i)roşanin/: ☜ **خروشاندن**

**خرۆشاو** / x(i)roşaw/: ئاوەڵناو. خرۆشای؛ خورڕۆشاو ☰ خروشیده

**خرۆشای** / x(i)roşay/: ☜ **خرۆشاو**

**خرۆشـــنای** / x(i)roşnay/: چـــاوگ. خســـــتنە خرۆشەوە ☰ خروشاندن

**خرۆشیان** / x(i)roşyan/: ☜ **خرۆشان**

**خرۆشـیای** / x(i)roşyay/: چـاوگ. هەڵـــقولان؛ هەڵقولین؛ لووزەوە بەستن (وەک شیر لـە سـنگی دایکدا) ☰ جوشیدن؛ فواره زدن

**خرۆندول** / x(i)rondul/: ☜ **خرندۆل**

**خرۆندوڵ** / x(i)rondul/: ☜ **خرندۆل**

**خروو** / x(i)rû/: ناو. خارشت؛ ئالۆش ☰ خارش

**خرووزەک** / x(i)rûzek/: ☜ **خرزەك**

**خرووسەک** / x(i)rûsek/: ☜ **خرزەك**

**خرووکە** / x(i)rûke/: ☜ **خرووکە**

**خرەپاندنەوە** / x(i)repandinewe/: چاوگ. کایە و دەسبازی کردن و تلاندنەوە ‹بەیانی هەر کـە چـاو دەکەنەوە، یەکتری دەخرەپێننەوە› ☰ بازی کردن و غلتاندن

**خرەفـان** / x(i)refan/: چـاوگ. تێنەپـەڕ. //خرەفـای؛ دەخرەفێی؛ بخرەفێ// خرەفیان؛ خرەفین؛ لە بـەر پیری ئاوەز لە دەست دان ☰ خرفت شدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: خرەفـاو/ چـاوگی نـەرێنی: نەخرەفان

**خرەفاو** / x(i)refaw/: ئاوەڵـناو. خرەفیو؛ خرەفیاگ؛ لە بەر پیری ئاوەز لە دەستداو ☰ خرفت شده

**خرەفیاگ** / x(i)refyag/: ☜ **خرەفاو**

**خرەفیان** / x(i)refyan/: ☜ **خرەفان**

**خرەفین** / x(i)refin/: ☜ **خرەفان**

**خرەفیو** / x(i)refiw/: ☜ **خرەفاو**

**خرەک** / x(i)rek/: ناو. کونی گوشاد (لە دیـوار و...) ☰ سوراخ فراخ (در دیوار و ...)

**خرەندول** / x(i)rendul/: ☜ **خرندۆل**

**خرەندۆڵ** / x(i)rendoł/: ☜ **خرندۆل**

**خریان** / xiryan/: چـاوگ. ١. لاڕێ بـوون؛ لـە ڕێ دەرچوون؛ بە هەڵەدا چوون ٢. ☜ **خـران** ☰ ١. گمراه شدن ٢. ☜ **خران**

**خریپ** / x(i)rîp/: ☜ **خرێ**

**خریچ** / x(i)rîç/: ناو. کاری مل پێوە نـان؛ پـەلامار دان ☰ هجوم

**خریشکە** / x(i)rîşke/: ناو. بـای ڕۆژهـەلاتی؛ بـای دەبوور ☰ باد دبور

**خریک**[١] / x(i)rîk/: ناو. کاری ڕاکێشـان؛ پاڵـکەفتن ☰ عمل دراز کشیدن

**خریک**[٢]: ئاوەڵناو. خلیسک؛ خز ☰ لیز

**خریک**[٣]: دەنگەناو. دەنگی گریان ☰ صدای گریه

**خریکاندن** / x(i)rîkandin/: چاوگ. ١. خزاندن بە سەر زەویندا ٢. خریکین؛ بە کوڵ گریان ☰ ١. بر زمین لغزاندن ٢. های ـ های گریستن

**خریکین** / x(i)rîkîn/: چاوگ. ١. ☜ **خریکاندن-٢** ٢. خلیســـکان؛ خـــزان؛ خزیـــان ☰ ١. ☜ **خریکاندن-٢** ٢. لیز خوردن؛ لغزیدن

**خرینگە**[١] / x(i)rînge/: نـاو. پارچـە خشڵـێکە ☰ نوعی زیور

**خرینگە**[٢]: ☜ **خرنگە**

**خرینگی** / x(i)rîngî/: نـاو. هەنیسک؛ بەرەنیسـکێ؛ هەناسەی سوار دەگەڵ گریان ☰ هقهق

**خرێ** / x(i)rê/: ناو. کاکیلە؛ خریپ؛ خلێنە؛ خرێنە؛ ددانی پانی لای کاکیلە ☰ دندان آسیا

**خرێفـەک** / x(i)rêfek/: نـاو. بانگێشـــتی هـــەموو

(خەڵکی ئاوایی) کە نانیان بدرێتێ ☰ مهمانی عمومی

**خڕێن**[1] / x(i)rên/: ناو. بەڵغەم ☰ بلغم

**خڕێن**[2]: ☜ **خورێن**[2]-١

**خڕێنگ** / x(i)rêng/: ناو. کرۆژە ☰ غضروف

**خڕێنە** / x(i)rêne/: ناو. ١. ☜ **خڕێ** ٢. گشتەکی چوار یان سێ هەودا ☰ ١. ☜ **خڕێ** ٢. سه یا چهار رشتەی به هم تابیده

**خڕ**[1] / xiř/: ناو. ١. کۆ؛ کۆم ٢. ئاودڕ؛ جێ لافاو ٣. شیوەڵە ‹ئەو ترۆپک و نشیوە/ ئەو یاڵ و خڕ و شیوە «هێمن»› ٤. گرێ لە پێست ☰ ١. جمع ٢. آبکند؛ مسیل ٣. درەی تنگ ۴. غدەی پوستی

⊡ **خڕ بوونەوە**: کۆ بوونەوە؛ کۆم بوون ‹ئەو عالەمە لە چی خڕ بوونەتەوە؟› ☰ گرد آمدن

**خڕ کردنەوە**: خڕ هەڵدان؛ لێک کۆم کردن ‹پیاوەکان خڕ کەوە!› ☰ گرد (هم) آوردن

**خڕ**[2]: ئاوەڵناو. ١. غڕ؛ گڕ؛ گرۆڤەر ‹زەوی خڕە› ٢. کەمەیی ‹کەلله بێژنگ خڕە› ٣. هەراو ‹کەوشەکانم خڕە› ☰ ١. گِرد ٢. حلقوی ٣. گُشاد

⊡ **خڕ بوون**: ١. هەڵتۆقینی پێست ٢. گرۆڤەر بوون ‹کەلاکەت خڕ بووە› ☰ ١. متورم شدن پوست ٢. مدور بودن

**خڕ کردن**: ١. گرۆڤەر کردن ‹گۆزەی دانا، جەرەی پڕ کرد/ بە بای شەماڵ مەمکی خڕ کرد/ چاوی گێڕا عاشقی قڕ کرد «گۆرانی»› ٢. کۆوە کردن؛ کۆم کردن؛ کۆ کردنەوە ☰ ١. گرد کردن ٢. گردآوری کردن

**خڕ کردنەوە**: خڕ هەڵدان؛ هەڵگرتنەوەی پەرژ و بلاو لە زەوین ‹ئەو گەنمە خڕ کەوە!› ☰ پراکنده را جمع‌آوری کردن

**خڕ هەڵدان**: ☜ **خڕ کردنەوە**

**خڕ**[3]: ئاوەڵکار. ١. هەموو؛ گش؛ گشت ‹خڕ هاتین، کەسمان لێ نەماوە› ٢. توند؛ قایم ☰ ١. همگی؛ همه ٢. مُحکم

**خڕ**[4]: لێل. ← **خڕوخاڵی؛ خڕوخۆڵ**

⊡ **خڕ داخستن**: توند/ قایم کردن ‹درگای زیندان خڕ داخرا› ☰ مُحکم بستن

**خڕاش** / x(i)řaş/: ناو. ڕووش ☰ خراش

**خڕاندن** / x(i)řandin/: ☜ **خورفاندن**

**خڕایی** / x(i)řayî/: ناو. ١. گردی؛ خڕی؛ دۆخ یان چۆنیەتی خڕ بوون ‹خڕایی گۆی زەوی› ٢. بەشی جەغزئاسای شتێک ‹دلۆپەکە شکا و چەند خڕایی لێ بۆوە› ☰ ١و٢. گردی

**خڕبۆقی** / xiřboqî/: ناو. جۆرێ گرێ ☰ نوعی گره

**خڕپوق** / xiřpoq/: ناو. پرخە؛ خرپە ☰ خُرناسه

**خڕتک** / xiřtik/: ناو. ١. خڕکەبەرد؛ کوچکی پڕ بە مشت ٢. کەندڕ؛ ئاودڕ؛ شیوی قووڵی تەنگ ☰ ١. قلوەسنگ ٢. آبکند

**خڕتەڵ** / xiřteł/: ئاوەڵناو. گنتەڵ؛ کورتی قەڵەو ☰ کوتاەقدِ چاق

**خڕتین** / xiřtîn/: چاوگ. دەرپەڕین؛ ترازان؛ لەپڕ هەلاتن ☰ ورجهیدن

**خڕخاشە** / xiřxaşe/: ناو. شەقشەقە ☰ جغجغه

**خڕخاکی** / xiřxakî/: ناو. پیرۆشک؛ خلێرە؛ خلێرە؛ خەرخودا ☰ خرخاکی

**خڕخاڵ**[1] / xiřxał/: ناو. ١. بازنە؛ خشڵی خڕی مەچەک، ژنان لە دەستی دەکەن ٢. پاوانەی پا لە زێڕ و زیو ‹دەس مەچەک چەرمێ خڕخاڵ وە پێوە/ ناکەس ئەیزرێ شەو لە ناو جێوە «فولکلۆر»› ٣. بازنەی دارین کە بە داری بێشکەدا کراوە ☰ ١. النگو ٢. پابرنجن ٣. حلقەهای چوبی آویزان بە گهوارە

**خڕخاڵ**[2]: ئاوەڵناو. [مەجاز] ورد و خان؛ تێکشکاو ‹هەموو ئێسکی لەشم بۆتە خڕخاڵ› ☰ خُرد و خاش

**خڕخاڵە** / xiřxałe/: ناو. خلانکە؛ خرخالە؛ گەو؛ بازنەی داری بێشکە ☰ حلقەهای چوبی آویزان بە

گهواره

**خرخاڵەدار** / xiřxałedar/: ☜ **خرخاڵەدار**

**خڕ ـ خڕ** / xiř xiř/: دەنگەناو. پشووسواری و دەنگ لە سنگەوە هاتن لە کاتی مەرگدا ☰ خُرناس حال نزع

**خڕخڕاکە** / xiřx(i)řake/: ناو. قورقوراگە؛ قوڕقوڕانچک؛ بینەقاقە؛ دەرناق ☰ خرخره

**خڕخڕۆک** / xiřx(i)řok/: ناو. تەرزە؛ تەزرە؛ تەیرۆک؛ تگر ☰ تگرگ

**خڕخڕە** / xiřx(i)ře/: ناو. ١. قرقرە؛ غەرغەرە؛ دارووکەی کون بۆ دەزوو لێ هەڵکردن ٢. تەگەرە؛ چەرخە عەرەبانە ٣. خرخاڵی قۆڵ و پا ٤. بەرچیلە؛ بەرخەبەبە ☰ ١. قرقره ٢. چرخ؛ تایر ٣. النگو ۴. غبغب

**خڕخەپان** / xiřxepan/: ناوەڵناو. قەڵەوی تەنگەئەستوور (بۆ ژن) ☰ چاقالو (زن)

**خڕڕە** / xiřře/: ☜ **خڕە**

**خڕک** / xiřk/: ناو. ١. پلەکان؛ پلەی قالدرمە ٢. خڕکەبەرد؛ چەوی پڕ بە مشت ٣. کونی قنگ ☰ ١. پلکان ٢. شن درشت ٣. پیزی؛ مقعد

**خڕکانە** / xiřkane/: ناو. مووخۆرکە؛ مووخڕکە؛ مووخۆرە ☰ موخوره

**خڕکۆک** / xiřkok/: ناوەڵناو. جوانکیلەی چکۆڵەی قەڵەو ☰ تُپُلی

**خڕکە** / xiřke/: ناو. ١. زیخی درشت؛ خیزی پڕ بە مشت ٢. جومگەی دەست و پا ٣. ئەستوورایی ڕەق لە پێست ☰ ١. قلوەسنگ ٢. مفصل دست و پا ٣. کبره

**خڕکەبەرد** / xiřkeberd/: ناو. خڕتک؛ خڕەبەرد؛ خڕک ☰ قلوەسنگ

**خڕکەگازۆڵە** / xiřkegazûle/: ناو. پەتاتە؛ سێفەزەمینی ☰ سیب‌زمینی

**خڕکەلانە** / xiřkełane/: ☜ **خرتۆڵ**[٢]

**خڕکەڵە** / xiřkełe/: ☜ **خرتۆڵ**[٢]

**خڕکین** / xiřkîn/: چاوگ. ڕاکێشان بە سەر زەویدا ☰ کشاندن

**خڕگین** / xiřgîn/: چاوگ. خزان؛ خزیان ☰ لیز خوردن

**خڕماڵ** / xiřmał/: ناو. کۆنەفرۆش ☰ کُهنەفروش

**خڕمچوون** / xiř(i)mçûn/: ناوەڵکار. چوارپەل (مالات) ‹ئەسپەکەم خڕمچوون نال کرد› ☰ چهار دست و پا (احشام)

**خڕمووسک** / xiřmûsik/: ناو. قورینج؛ قورینجان؛ نقورچک؛ کاری گرتن و گوشار دانی پاژێک لە پێستی لەش بە دوو قامک ☰ نیشگون

**خڕناش** / xiřnaş/: ☜ **خمخم**[١]

**خڕناک** / xiřnak/: ناو. لووت؛ کەپۆ ☰ بینی

**خڕنک**[١] / xiřnik/: ☜ **خڕنەق**

**خڕنک**[٢]: ناوەڵناو. جوان و لەبەردڵ ☰ زیبا و دلُربا

**خڕنۆک** / xiřnûk/: ناو. ١. جۆرێ بەری دارمازوو ٢. گیایەکە بەرێکی خڕ دەگرێ ☰ ١. نوعی ثمر درخت مازوج ٢. گیاهی است

**خڕنە** / xiřne/: ناو. کوودەڵە؛ بێچووی بەراز ☰ بچەگُراز

**خڕنەق** / xiřneq/: ناو. خڕنک؛ بەچکە کەروێشک ☰ بچەخرگوش

**خڕنەک** / xiřnek/: ناو. قرقرە؛ غەرغەرە؛ مەکارە ☰ قرقره

**خڕنیفک** / xiřnîfik/: ناو. بەرێکی دار مازوو ☰ نوعی ثمر درخت مازوج

**خڕوپڕ** / xiř û piř/: ناوەڵناو. قەڵەوی توند و تۆڵ ☰ تُپُل چالاک

**خڕوجز** / xiř û ciz/: ناو. کێشە و هەرا و هوریا ☰ جار و جنجال

**خڕوخاڵی** / xiř û xalî/: ناوەڵناو. چۆڵ؛ چۆڵوهۆڵ ‹بیابانی خڕوخاڵی› ☰ برهوت

**خڕوخۆڵ** / xiř û xoł/: ئاوەڵناو. جوان و لەبەردڵان 🇮🇷 زیبا و دلپسند

**خڕوخەپان** / xiř û xepan/: ئاوەڵناو. قەڵەوی لەبار و جوان 🇮🇷 درشت متوازن

**خڕوگز** / xiř û giz/: ئاوەڵکار. کوتوومت؛ کتومت؛ هەر وەک ‹ئارام خڕوگز باوکییە› 🇮🇷 عیناً

**خڕومڕ** / xiř û miř/: ئاوەڵناو. تێرگۆشتی جوان و ڕند 🇮🇷 چاق و زیبا

**خڕۆکە** / x(i)řoke/: ناو. گۆیژە؛ گلوبوول؛ هەرکام لە خانەکانی نێو پلاسمای خوێن 🇮🇷 گلبول

▣ **خڕۆکەی سپی**: گلوبوولی سپی؛ گۆیژەی سپی؛ زۆرێک خانەی خڕ و بێڕەنگی نێو پلاسمای خوێن کە لەش لە ئاست باکتری و دژمنانی دەرەکی دەپارێزن 🇮🇷 گلبول سفید

**خڕۆکەی سوور**: گلوبوولی سوور؛ گۆیژەی سوور؛ خانەگەلی زەردباوی نێو پلاسما کە سەرجەم پێکەوە ڕەنگی خوێن سوور دەکەن و ئوکسیژن لە سییەوە بۆ شانەکانی لەش و بە پێچەوانەی، گازی کەربون ڕادەگوێزن 🇮🇷 گلبول قرمز

**خڕوو** / x(i)řû/: جێناو. گشتان؛ ئێوە هەمووتان 🇮🇷 همەی شما

**خڕە** / x(i)ře/: دەنگەناو. خڕە؛ دەنگی وێک‌کەوتنی شتی خڕ لە باردا ‹خڕەی گوێز دێت› 🇮🇷 خِرخِر

**خڕەبەرد** / x(i)řeberd/: ناو. خڕکەبەرد 🇮🇷 قلوەسنگ

**خڕەخڕ** / x(i)řexiř/: دەنگەناو. دەنگی خڕەی زۆر 🇮🇷 خِرخِر متوالی

**خڕەخڕکەر** / x(i)řexiřker/: ئاوەڵناو. نوکوچەک؛ خلەخل‌کەر 🇮🇷 لق ـ لق‌زن

**خڕەکە**[1] / x(i)řeke/: ناو. کولەدارێکی بە قەد بستێکە، نەقیزەیەکی پێوەیە بە پەتێکەوە، سوار لە مەچەکی دەکا، بۆ لێخوڕینی یەکسم 🇮🇷 چوب کوتاه نوک‌تیز راندن ستور که سوار با ریسمانی به دست می‌کند

**خڕەکە**[2]: ئاوەڵناو. چکۆڵەی گرد و قەڵەو 🇮🇷 خپله

**خڕی** / x(i)řî/: ئاوەڵناو. گوەل؛ جغزی 🇮🇷 مُدور

**خڕیایی** / x(i)řyayî/: ↓

▣ **وە خڕیایی**: بە وردی؛ باش ‹ــ کەنیشکەکەیان زەریفە؟ ـ نازانم، وە خڕیایی تماشام نەکردگە› 🇮🇷 به دقّت

**خڕید** / x(i)řîd/: ناو. کاری سەندن؛ کڕین 🇮🇷 خرید

**خڕیلانە** / x(i)řîlane/: ☜ **خرتۆڵ**[2]

**خڕیلە** / x(i)řîle/: ☜ **خرتۆڵ**[2]

**خڕین**[1] / x(i)řîn/: ☜ **خورفین**

**خڕین**[2]: ناو. پرخە 🇮🇷 خُرناس

**خڕینەبڕە** / x(i)řîneb(i)ře/: ناو. چوار ددانی گەورەی پێشەوەی مرۆڤ 🇮🇷 دندان‌های پیش

**خز**[1] / xiz/: ناو. ١. جێگەی خلیسکان ٢. لە بەر ماندوویی دەنگ لە سینگەوە هاتن 🇮🇷 ١. لیزگاه ٢. خش‌خش سینه از خستگی

▣ **خز بردن**: داکشان بە سەر زەویدا 🇮🇷 بر شکم خزیدن

**خز بردنەوە**: لە بەر پێکەنین بە پشتا کەوتن 🇮🇷 از شدت خنده بر قفا افتادن

**خز**[2]: ئاوەڵناو. خژ؛ غز؛ لووس؛ خلیسک 🇮🇷 لیز

**خزار** / x(i)zar/: ناو. شەقەمشار؛ هەرەی دووکەسی 🇮🇷 ارّەی دونفره

**خزاگ** / x(i)zag/: ناو. خزانگ؛ پێڕاگۆزی بێ‌چەرخی سەر بەفر و یەخ کە بە خلیسکان دەڕوات 🇮🇷 سورتمه

**خزان**[1] / x(i)zan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //خزای؛ دەخزێ؛ بخزێ// خزای: ١. لە سەر سنگ ڕۆیشتن ٢. چوونە ناو جێگەی تەنگەوە ‹تەم بە بەرگی شین سەرکێوی پۆشی/ بولبول خزایە لانەی خامۆشی «پیرەمێرد»› ٣. خۆ بەرەو خوار کشاندن 🇮🇷 ١.

خزیدن روی سطح ۲. در سوراخ خزیدن ۳. پایین لغزیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: خزاو/ چاوگی نەرێنی: نەخزان

**خزان**[۲]: ئاوەڵناو. فەقیر؛ نەدار؛ دەس تەنگ ‹ئەم خزانێ ماڵن/ نە خزانێ ئێد ئالن «قەدری جان»› 🇮🇷 فقیر؛ بینوا

**خزاندن** / x(i)zandin/: چاوگ. تێپەڕ. //خزاندت؛ دەخزێنی؛ بخزێنە// خزانن؛ کشاندن بە سەر زەویندا ‹زەمانە داخەکەم باڵی شکاندی/ لە ناو داڵ و قەل و کوندی خزاندی «هێمن»› 🇮🇷 بر زمین کشاندن؛ لغزاندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەخزاندن

**خزانگ** / x(i)zang/: ☜ **خزاگ**

**خزانن** / x(i)zanin/: ☜ **خزاندن**

**خزای** / x(i)zay/: ☜ **خزان**[۱]

**خزخزان** / xizx(i)zan/: ☜ **خلیسکانێ**

**خزخزۆک** / xizx(i)zok/: ناو. تەرزەی ورد؛ تەرزۆکە؛ تەیرۆکی بووچک 🇮🇷 تگرگ ریز

**خزخزەکانێ** / xizx(i)zekanê/: ☜ **خلیسکانێ**

**خزکە** / xizke/: ☜ **خسکە**

**خزکێ** / xizkê/: ناو. خزخزان؛ خسکێ؛ خش خشان؛ خلیسکێن 🇮🇷 سُرسُرەبازی

**خزگە** / xizge/: ناو. ۱. خلیسکان؛ جێگەی شەمتین ۲. جێگەی کۆ بوونەوەی ماسیان لە شوێنی مەند و پەنادا 🇮🇷 ۱. لیزگاه ۲. محل تجمع ماهیان در آب آرام

**خزگەماسی** / xizgemasî/: ناو. خوز؛ خوزە؛ شوێنی قولاغە دانی ماسی 🇮🇷 پناهگاه ماهیان

**خزلک** / xizlik/: ناو. تیسک؛ تیسکە؛ زەنگەتەرێ؛ تلیسکی هەنگوور 🇮🇷 تلسک انگور

**خزم** / xizm/: ناو. خوێش؛ قەوم؛ قۆم؛ کەس و کار ‹خزم، ئازاری هەیە بێزاری نییە «مەسەل»› 🇮🇷 خویشاوند

**خزمایەتی** / xizmayetî/: ناو. خوێشی؛ خزمی؛ خۆیایەتی؛ خۆیەتی؛ قۆمایەتی 🇮🇷 خویشاوندی

**خزمدۆست** / xizmdost/: ئاوەڵناو. قەوم خۆشەویست 🇮🇷 دوستدار قوم و خویش

**خزموخوێش** / xizm û x(i)wêş/: ☜ **خزموکەس**

**خزموکەس** / xizm û kes/: ناو. خزم و خوێش؛ کەس و کار؛ قەوم قەبیلە؛ قەوم و ئەقرەبا 🇮🇷 کس‌وکار

**خزمەت** / xizmet/: ناو. خەمەت؛ خەومەت؛ خەڵمەت: ۱. ڕاژە؛ کارێ کە قازانجی بۆ دیترانە ‹مەلا کەریم و کوڕەکانی زۆریان خزمەت بە زمان و وێژەی کوردی کرد› ۲. خزمەتی مەزرینگەیی؛ کاری دەوڵەتی ‹لە ئیدارەی پۆست خزمەت دەکەم› ۳. سەربازی ‹کوڕە گەورەکەم چۆتە خزمەت، ساڵێکی ماوە› ٤. ئاسانە؛ بارەگا؛ لا ‹... ئەوە پێی بڵێنەوە بە سوێسنێ بە سومبلێ بە سوورەگوڵێ بە گیابەند و خاوێ، سەر بێننە دەرێ لە بارستی دە خاکی؛ بە عام ڕاوەشێنن لە خزمەت بارانەی دە پەلێ ... «بەیتی پایزە»› 🇮🇷 ۱. خدمت ۲. کار اداری ۳. سربازی ۴. حضور؛ مقابل

⊡ **خزمەت کردن**: کار بۆ کەسێک کردن؛ ڕێز گرتن و بە دەوردا هاتن ‹بیست و حەوت ساڵە من ڕەنجبەری تۆم/ بە نان و ئاو و جل و بەرگی خۆم/ خزمەتم کردی لە ئێران و ڕۆم/ کەچی هێشتا هەر دیل و ڕەنجەڕۆم! «بێکەس»› 🇮🇷 خدمت کردن

**خزمەتی داری پەلک کردن**: *[کینایە]* ئاو هەسەو کردن؛ خەریکی کاری بێ کەڵک بوون 🇮🇷 آب در هاون کوبیدن

**لە خزمەتدا بوون**: ئامادە بوون بۆ کار کردن ‹هەمیشە دوو پاسداری دەست لە سەر دەمانچە لە خزمەتیدا بوون «هەژار، چێشتی مجێور»› 🇮🇷 در خدمت بودن

**خزمەتانە** / xizmetane/: ناو. دەسخۆشانە؛ ڕێزانــە یان پاداشی خزمەتێکی دیاریکراو ☜ خدمتانە
**خزمەتچی** / xizmetçî/: ☜ **خزمەتکار**
**خزمــەتکار** / xizmetkar/: نـــاو. خزمــــــەتچی؛ خزمــەتگوزار؛ هەژمــە؛ مــەرڤ؛ خــولام؛ خــوبزە؛ نۆکەر؛ کورتێلۆ؛ کەسێ کە لە هەمبەر وەرگـرتنی مز یان شتێک لە شـوێنێکدا کـار دەکـا ‹خـاوەن سینەماکان بۆ ڕاکێشانی لاوان، کچی زۆر جوانیان بـە خزمەتکار ڕادەگرت «هــەژار، چێشــتی مجێــور»› ☜ خدمتکار
**خزمــەتکاری** / xizmetkarî/: نـــاو. نۆکـــــەری ☜ خدمتکاری
**خزمەتکۆشـی** / xizmetkoşî/: نـــاو. خزمـــــەت ☜ خدمتگزاری
**خزمەتگوزار** / xizmetguzar/: ☜ **خزمەتکار**
**خزمەتـەکاری** / xizmetekarî/: نـاو. بەردەســـتی؛ نۆکەری ☜ نوکری
**خزمی** / xizmî/: ☜ **خزمایەتی**
**خزمینە** / xizmîne/: سارستە. ئەی خـزم و کەسـان ‹خزمینە مەدەن پەنجـە لـەگـەڵ عـەشـرەتی جافـا/ مێرووله نەچێ چاکە بە گژ قوڵلەیی قافا «شێخ ڕەزا»› ☜ ای خویشاوندان
**خزن** / xizn/: ناو. ١. سەنگچن؛ کاری بەرد لە سەر یەک هەڵچنین ٢. کەڵەکەبەرد ٣. قسن؛ چـاک؛ گۆڕی پیرۆز کە بۆ نیـازان دەچنـە سـەری ☜ ١. سنگچینی ٢. سنگچین ٣. زیارتگاه
**خزنای** / xiznay/: چاوگ. خزاندن ☜ لغزاندن
**خزنە**[١] / xizne/: ناو. گەنجینە؛ گەنج ☜ گنجینە
**خزنە**[٢]: ئاوەڵناو. خـزۆک؛ بـە تایبەتمەنـدی یـان توانایی خزینەوە ☜ خزندە
**خـزۆک**[١] / x(i)zok/: نـاو. جێگــەی خلیســکان ☜ لیزگاه
**خزۆک**[٢]: ☜ **خزنە**[٢]

**خزی** / x(i)zî/: ناو. تووز؛ خلیسک ☜ لیزی
**خزیـاگ** / xizyag/: ئاوەڵناو. ســەرگرتە؛ شــەمتی؛ خلیسکاو ☜ لیزخوردە
**خزیان** / xizyan/: ☜ **خزین**
**خزیخــزی** / x(i)zîx(i)zî/: نـاو. چێشـــــتی وردە ســاواری بــێ ڕۆن کــە بــە منالــی دەدەن ☜ آش ریزەبلغور بدون چربی، غذای کودکان
**خزیلک** / x(i)zîlik/: ناو. ١. خزگەی خلیسـکان ٢. جۆرێ کرمی لووس و زەردە لە جێگای شـێداردا دەژی ☜ ١. لیزگاه ٢. نوعی کرم
**خزین** / x(i)zîn/: چاوگ. تێنەپەڕ. //خزیت؛ دەخـزی؛ بخزە// خزیان: ١. بەرەو خوار خشـکە کـردن ٢. ڕاخوشین؛ بە لەش بە سەر زەویـدا چـوون ☜ ١. فروخزیدن ٢. خزیدن
■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: خزیـو/ چـاوگی نـەرێنی: نەخزین
**خــزێم** / x(i)zêm/: نـاو. خزێمــۆک؛ پۆزمـــک؛ لووتەوانە؛ خشڵێ کە ژنان لـە لـووتی دەکـەن ☜ زیور بینی
**خزێمـۆک** / x(i)zêmok/: نـاو. ١. ☜ **خــزێم** ٢. گیایەکە ☜ ١. ☜ **خزێم** ٢. گیاهی است
**خژ** / xij/: ☜ **خز**[٢]
**خژخژان** / xijx(i)jan/: ☜ **خزکێ**
**خژین** / x(i)jîn/: ناو. کێشە و هەرا؛ ئاژاوە ☜ آشوب
**خس** / xis/: ناو. خست؛ کاری خۆ مراندن؛ خۆ کـز کردن و مات بوون لە شتێک ☜ عمـل خـود را بـە موش‌مردگی زدن
**خست** / xist/: ☜ **خس**
**خستن** / xistin/: چاوگ. تێـپەڕ. //خسـتت؛ دەخـەی؛ بخە// ١. هاویشـتن؛ ئـاویتن؛ فـڕێ دان؛ شـانای ‹پەلێکی بـۆ خسـت› ٢. داراندنـەوە؛ سـەرنخوون کردن؛ هۆرویڵـنەی ‹پـای لـێ دا خسـتی› ٣. لـە جووڵە یان کار بێبەش کردن ‹لە کـاری خسـت›

٤. هێنانە ناو بارودۆخێکەوە ‹دەسا ئەو راوکەرە کوێر بێ لە چاوان/ منی خستە قەفەز بێ سووچ و تاوان «هێمن»› ٥. پێوە لکاندن ‹شێرەکەی لێ خست› ٦. ڕۆشنایی ڕۆکردنە جێگایەک ‹چراکەی لێ خست هەڵات› ٧. نانە زەوی ‹باری خست› ٨. بە زەویدا دان لە زۆرەوانێدا ☰ ١. انداختن؛ پرت کردن ٢. افکندن؛ سرنگون کردن ٣. از کار انداختن ۴. به وضعی درآوردن ۵. وصل کردن ۶. نور بر جایی افکندن ۷. زمین گذاشتن ۸. بر زمین زدن در کُشتی

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەخستن

**خستنەوە** / xistinewe/: چاوگ. تێپەڕ. //خست(ت)ەوە؛ دەخەیەوە؛ بخە(رە)وە// ١. [پلار] زەوزوو/ زکوزا کردن ‹سەر و بن ساڵێ دوو منداڵی خستەوە!› ٢. دیسان خستن (بە هەموو ماناکانییەوە) ☰ ١. بچە پس انداختن ٢. دوبارە انداختن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەخستنەوە

**خسک** / xisik/: ناو. تۆمی پیاز ☰ بذر پیاز

**خسکە** / xiske/: ناو. خزکە؛ پیوازی زۆر ورد کە لە باتی تۆم ئەیچێنن ☰ پیاز ریز کاشتنی

**خسکێ** / xiskê/: ☜ **خزکێ**

**خش** / xiş/: دەنگەناو. ١. دەنگی لێکساویانی دوو شتی نەرم و وشک ٢. دەنگی گاسن لە کاتی زەوی کێلاندا ☰ ١. خِش ٢. صدای گاوآهن هنگام شخم

**خشان** / x(i)şan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //خشای؛ دەخشێ؛ بخشێ// ١. خوشین؛ خشیان؛ بە سەر عەرزا ڕۆیین ٢. لە یەک ساوینی دوو شت ‹دەستی لە دەستم خشا› ☰ ١. خزیدن ٢. به هم سایيده شدن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: خشاو/ چاوگی نەرێنی: نەخشان

**خشاندن** / x(i)şandin/: چاوگ. تێپەڕ. //خشاندت؛ دەخشێنی؛ بخشێنە// خشانن: ١. ڕاکێشان بە سەر زەویدا ٢. ساوینی شتێ لە شتێ ‹وەرە با دەست لە بالاکەت وەرێنم!/ وەرە کوڵمەم لە کوڵمەی تۆ خشێنم! «هێمن»› ☰ ١. بر زمین کشیدن ٢. بر هم ساییدن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەخشاندن

**خشانن** / x(i)şanin/: ☜ **خشاندن**

**خشپن** / xişpin/: ئاوەڵناو. خرپن ☰ خپله

**خشپە** / xişpe/: دەنگەناو. دەنگی وێکەوتن و پێدا ساوینی شتێکی ڕەق لە گیای وشک و ... ‹کێ لە دیواخان کێ لە حەوشی بێ؟/ گیانم بە قوربان خشپەی کەوشی بێ «فولکلۆر»› ☰ خِش‌خِش

**خشپەخشپ** / xişpexişp/: دەنگەناو. خشپەی زۆر ☰ خِش‌خِش زیاد

**خشپەگیا** / xişpeg(i)ya/: ناو. دار خەلاتە؛ سیادەرمان؛ گەلابزن؛ زەرداو پەڕێنە ☰ پیچ امین‌الدوله

**خشپیلانە** / xişpîlane/: ئاوەڵناو. خشپیلە؛ خشتیلە؛ چکۆلەی جوانکیلە ☰ کوچولوی دوست‌داشتنی

**خشپیلە** / xişpîle/: ☜ **خشپیلانە**

**خشت**[1] / xişt/: ناو. ١. خشتە؛ خێشت؛ قوڕی پێژراو بۆ دیوار کردن ‹باری دڵ وە خشت وێرانی ئاوان/ حەقت وە دەستەن نەداری تاوان «مەولەوی»› ٢. کەرپووچ؛ ئاجور؛ قوڕی پێژراوی سوورەوە کراو بۆ ماڵ کردنەوە ٣. زەرگ؛ سیخی دەروێشان ☰ ١. خشت ٢. آجر ٣. سیخ دراویش

⊡ **خشت برین**: دە قالب کردنی قوڕ بۆ کەرپووچ ☰ خشت زدن

**خشت**[2]: ئاوەڵناو. ١. گرۆڤەر؛ خرت ٢. سەردادراو ☰ ١. گرد و مُدوَّر ٢. قطع زده شده

⊡ **خشت کردن**: برین بۆ ڕێکوپێک کردن ‹دا سەر ئەو دارە بە چەقۆ خشت کە!› ☰ قطع زدن

**خشت**[3]: ئاوەڵکار. ١. بێ کەموزیاد ‹گشتی خشت

ڕژاندە زەوی› ٢. ڕێک ‹بالام خشت بە قـەد بالاتـە›
🇮🇷 ١. تام و تمام ٢. درست؛ دقیق

◙ **خشت بڕین**: سەری شتێ ڕاست قرتاندن 🇮🇷 سر چیزی را دقیق قطع زدن

**خشت‌بڕ** / xiştbiř/: ناو. کەسێ کـە کـەرپووچ دە قالب دەکا . هەروەها: **خشت‌بڕی** 🇮🇷 خشت‌زن

**خشت‌پێژ** / xiştpêj/: ناو. قالـبدار؛ خشـت‌بـڕ 🇮🇷 خشت‌زن

**خشتکان** / xiştkan/: چاوگ. خوران؛ بـە خارشـت بوون؛ وە خروو هاتن 🇮🇷 خاریدن

**خشتکاندن** / xiştkandin/: چاوگ. خورانـدن 🇮🇷 خاراندن

**خشتوخاڵ**[١] / xişt û xał/: ناو. خت‌وخاڵ؛ پاشمـاوە و ڕۆنیشتوو لە شتێک ‹خشت‌وخالی خـەرمان› 🇮🇷 تە ماندە

**خشتوخاڵ**[٢]: ئاوەڵناو. خشـت‌وخالـی؛ خـت‌وخـاڵ؛ هالی و هەوێلا؛ بێ هیچ شتێکی تر ‹مالێکی سارد و خشت‌وخالیان پێ داین› 🇮🇷 خشک‌وخالی

**خشتوخالی** / xişt û xałî/: ☜ **خشت‌وخاڵ**[٢]

**خشتوور** / xiştûr/: ئاوەڵناو. خاپوور؛ وێران 🇮🇷 ویران

**خشتە** / xişte/: ناو. ١. خشـت؛ خێشـت ٢. بـاڵ؛ نیوە شـیعر ٣. چوارخانـە ٤. [کینایە] ئـاوەز 🇮🇷 ١. خشت خام ٢. مصرع شعر ٣. جدول ٤. شعور

▣ **خشتەی لێکدان**: جەدوەل زەرب 🇮🇷 جدول ضرب

◙ **لە خشتە بردن**: فریـو دان ‹بـە خالـۆ خالـۆ لـە خشتەت بردم/ لە بەفراو خواردن کوێستانت کـردم «فولکلۆر»› 🇮🇷 فریفتن

**خشتەک** / xiştek/: نـاو. گـــرۆڵ؛ پارچــــەی سێ‌سووچی بن‌باخەڵ لە چۆغەدا 🇮🇷 قطعه پارچەی مثلثی برخی لباس‌ها

**خشتەنداز** / xiştendaz/: ☜ **خشتەنناز**

**خشتەنناز** / xiştennaz/: ناو. خشتەنداز؛ کەسێ کە خشت بۆ وەستا هەڵدەدا 🇮🇷 کارگری کە آجر بە بنا می‌رساند

**خشتیلە** / xiştîle/: ☜ **خشپیلانە**

**خشتین** / xiştîn/: دەنگەناو. خشـەخش؛ خشـپە 🇮🇷 خِش‌خِش

**خش‌خشان** / xişx(i)şan/: ☜ **خزکێ**

**خشخشانکێ** / xişx(i)şankê/: نـاو. خلیسـکێن 🇮🇷 سُرسُرەبازی

**خش‌خشک** / xişxişk/: ناو. وردە؛ خوردە؛ وردە دراو 🇮🇷 پول خُرد

**خشخشۆک** / xişx(i)şok/: نـاو. خشـک؛ خشـکە؛ خشگ؛ خشی؛ هەزارپێ؛ هـەزارپا؛ پرپـە؛ زێلـوو؛ زۆڤ 🇮🇷 هزارپا

**خشخشە** / xişx(i)şe/: نـاو. جـۆرێ نەخۆشـینی ئاژەڵە 🇮🇷 نوعی بیماری دام

**خشر** / xişr/: ☜ **خشڵ**

**خشروخاڵ** / xişr û xał/: ناو. زەنبەر؛ خشڵ 🇮🇷 زیور

**خشرۆک** / xişrok/: نـاو. تامیسـک؛ تێمێسـک 🇮🇷 تبخال

**خشک** / xişk/: ناو. ١. ☜ **خشخشۆک** ٢. ئاومالک؛ ئەوی لافاو دەیهێنێ ٣. قۆزاخەی وشکەوەبوو ٤. پارچە- پارچەی سـەهۆڵ بـە سـەر ئـاوەوە 🇮🇷 ١. ☜ **خشخشۆک** ٢. سیل‌آوردە ٣. غوزەی خشک‌شدە ۴. کاشەهای یخ روی آب

**خشکان** / xişkan/: چاوگ. خلیسکان 🇮🇷 لغزیدن

**خشکاندن** / xişkandin/: چاوگ. خلیسـکاندن 🇮🇷 لغزاندن

**خشکۆک** / xişkok/: ئاوەڵـناو. سـپـەهی؛ دەلال؛ جوانکیلە؛ قەشەنگ؛ جوان 🇮🇷 زیبا

**خشکە** / xişke/: نـاو. ١. پـێ‌دزە؛ پـێ‌خشـکە؛ پێ‌دزکێ؛ پاچرکێ؛ قولەپسکێ؛ بزدم؛ تەلە- تەلە؛ ماتەمات؛ پسوو- پسوو؛ هێدی و بێ‌چرکە؛ کـاری لە سەر پەنجە ڕۆیشتن ٢. کاری خزین لـە سـەر زەویـن ٣. هەڵـماتی خسـتن لـە مێشـێندا،

پێچەوانـەی هەڵـگرتە ٤. ☜ **خشخشـۆك** ☰ ۱. پاورچین ۲. عمل خزیـدن ۳. تیلـەهـای متحـرک در تیلەبازی ۴. ☜ **خشخشۆك**

**خشکەیی**[1] / xişkeyî/: ناو. دۆخی نەوی فڕینی مەل ☰ پرواز با ارتفاع کم

**خشکەیی**[2]: ئاوەڵکار. ۱. کاری پێ بە عەرزا خشاندن لە ڕۆیشتندا ۲. کاری بە دزییەوە بۆ چـوون ☰ ۱. عمل پا بر زمین ساییدن در راه رفتن ۲. پاورچین

**خشگ** / xişg/: ☜ **خشخشۆك**

**خشگە** / xişge/: نـاو. خشێنەک؛ شوێنی خشین لە زەمیندا ☰ اثر کشیده شده روی زمین

**خشڵ** / xişł/: نـاو. خشـر؛ زێـڕ و زەنبـەر؛ ڕەوش ‹شاخەی شریخەی خشڵ نیمەڕەنگ/ فرەی فۆتـەی شۆڕ پاژنۆی گولەنگ چەنگ «مەولەوی»› ☰ زیور

**خشڵوخاو** / xişł û xaw/: ناو. تاس‌وتەبەق ☰ زیـور زنانە

**خشنای** / xişnay/: چاوگ. خشـاندن: ۱. خزانـدن ۲. تەک دانە پاڵ شتێکەوە ☰ ۱. بر زمین کشـیدن ۲. بە چیزی نزدیک یا مماس کردن

**خشندە** / x(i)şinde/: نـاو. خشـۆک؛ خشـەک؛ خشننە؛ گیاندارانێ کە بە خشکە دەڕۆن ☰ خزندە

**خشننە** / x(i)şinne/: ☜ **خشندە**

**خشۆک** / x(i)şok/: ☜ **خشندە**

**خشە** / x(i)şe/: دەنگەناو. دەنگی وشکەگیا کە مار و شتی تر بە سەریا دەڕۆن ☰ خِش‌خِش

**خشەخش**[1] / x(i)şexiş/: ئاوەڵـکار. وێـرای دەنگـی خشەخش ‹خشەخش لەو لاوە هـات و لێـرە خـۆی شاردەوە› ☰ خش ـ خش کنان

**خشەخش**[2]: دەنگەناو. دەنگـی لێکـدان و بـە زەویـدا کێشرانی شتی وشـک و سووک ☰ خش ـ خش

**خشەک** / x(i)şek/: ☜ **خشندە**

**خشی** / x(i)şî/: ☜ **خشخشۆك**

**خشیان** / xişyan/: چاوگ. خشـین: ۱. ڕاکێشـران بە زەمیندا ۲. خزین بە سەر زەویدا ☰ ۱. بر زمین کشیدە شدن ۲. خزیدن

**خشیای** / xişyay/: ☜ **خشان**

**خشیل** / x(i)şîl/: نـاو. کەوڵـەگیـا؛ شـۆت‌گرسـێن؛ ڕووەکێکی چـەن‌ساڵـەیە، ٤٠ سـانتی‌میتـر بـەرز دەبێ، لاسـکەکانی تۆزێـک کوڵـکنە، گـەڵاکانی سەوزێکی تۆخ و گوڵەکانی زەردی بۆنخۆشـە ☰ علف پنیر؛ شیر پنیر

**خشیم** / x(i)şîm/: ئاوەڵناو. ۱. نەزان؛ گەوج؛ نـەفام ۲. ساویلکە؛ حەپۆل؛ حۆل ☰ ۱. نادان ۲. ابله

**خشین** / x(i)şîn/: ☜ **خشیان**

**خشێنەک** / xişênek/: ☜ **خشگە**

**خفتان** / xiftan/: نـاو. ۱. کاری تۆم پێوە کردن بەر لە هەرەتی باران ۲. کراسی بن زرێ بۆ جەنگ ☰ ۱. بذرافشانی قبل از موسم باران ۲. خفتان

**خک** / xik/: ناو. خگ؛ دارکاری زۆر ☰ کتـک‌کـاری مفصل

**خگ** / xig/: ☜ **خك**

**خل** / xil/: ئاوەڵناو. ۱. خڕ؛ گوشاد ‹بۆ شتێ کە تێـی خراوە› ‹هێندە هەراوە شووتی پێ خلـە!› ۲. گـلار؛ تل؛ گل ۳. کون ـ کـون؛ فشەڵـۆک؛ بـە کـون و هولۆلییەوە ☰ ۱. گُشاد ۲. غلتان؛ تلوتلو ۳. مُتخلخل

◻ **خل بوونەوە** گل بوونـەوە؛ خلـەو بـوون؛ خلـۆر بوونەوە ☰ غلتیدن

**خل کردنـەوە** خلـەو کـردن؛ گلانـدن؛ خلـۆر کردنەوە؛ گلار کردنەوە ‹بەردێکم خل کـردەوە› ☰ غلتاندن

**خلەو بوون** ☜ **خل بوونەوە**

**خلەو کردن** ☜ **خل کردنەوە**

**خلات** / x(i)lat/: ناو. کفن؛ کەفەن ☰ کفن

**خلار** / x(i)lar/: ☜ **خلۆر**

**خلان** / x(i)lan/: چـاوگ. خـل بوونـەوە؛ تـلان ☰ غلتیدن

**خلانکه** / x(i)lanke/: ☜ **خرخالّه**

**خلانه** / x(i)lane/: ناو. تەرە؛ قوولکەی میوە تێدا ڕاگرتن ☰ چالەی نگهداری میوه

**خلت** / xilt/: ناو. جرج؛ مشکەکوێرەی دەشت ☰ موش‌کور صحرایی

**خلج** / xilc/: ناو. گەمەیەکە منداڵ دار دە قوڕ دەچەقێنن هەرکی توانی دەری بخا ئازایە ☰ از بازی‌های کودکان

**خلخل**[1] / xilxil/: ناو. ۱. تەرزۆکە؛ گلێرکە ۲. ☜ **خلخله** ☰ ۱. تگرگ ریز ۲. ☜ **خلخله**

**خلخل**[2]: دەنگەناو. خشپەی زۆر بە سەبری پا ☰ صدای پاورچین راه رفتن

**خلخله** / xilx(i)le/: ناو. خلخل؛ مەلێکە لە خێزانی مراوی و لە تیرەی وەردۆک، درێژاییەکەی ۳۷ سانتی‌متیرە، کەمێک لە جوڕە گەورەترە، لە کاتی فریندا پێش باڵی مەیلەو شین و سینگی قاوەییە، کەم وا هەیە بچێتە ناو ئاوی سوێر، لە ناو گیا و گوڵی چڕدا هێلانە دەکا ☰ خوتکای سفید

**خل‌خۆر** / xilxor/: ئاوەڵناو. تلار؛ تلۆر؛ تلێر ☰ غلتان

**خلک** / xilk/: ناو. ۱. کووپەڵەی ڕۆن تێ‌کردن ۲. خڕکە بەرد؛ وردەکوچک ☰ ۱. بستو ۲. قلوه سنگ

**خللۆر** / xillor/: ☜ **خلۆر**

**خلماتان** / xilmatan/: ناو. زقان؛ هەڵماتان؛ ماتان؛ مێشان؛ پلان ☰ تیله‌بازی

**خلماش** / xilmaş/: ناو. وەنەوز؛ بیرەخەو ☰ پینکی

**خلندۆر** / x(i)lindor/: ناو. گیایەکە دەکرێ بە چێشت و لە لۆرکی دەکەن ☰ گیاهی است

**خلنزەر** / x(i)linzer/: ناو. ۱. زەردەقۆڕە؛ قومقومە؛ قووڕییەزەرد؛ شین‌شینک؛ لووس‌لووسک؛ جۆرێ مارمێلکەی درشتە دەگەڵ گیا ڕەنگ دەگرێ ۲. بووکەڵەی منالان ☰ ۱. آفتاب‌پرست ۲. عروسک

**خلنگ** / x(i)ling/: ناو. لەنجە؛ ڕەوتی بە نازەوە چوونە ڕێدا ☰ خرام

**خلنگین** / x(i)lingîn/: چاوگ. لەنجە کردن؛ بە ناز ڕۆیشتن ☰ خرامیدن

**خلۆپه** / x(i)lope/: ئاوەڵناو. ۱. ناسک و تەنکەڵە ۲. چکۆلەی جوانکیلە ☰ ۱. باریک‌اندام ۲. کوچولو

**خلۆخه** / x(i)loxe/: ئاوەڵناو. ۱. واڵا؛ پووک؛ ناوبەتاڵ ۲. *[پلار]* زگ‌هەڵمساو لە بەر زۆر خواردن ☰ ۱. توخالی ۲. شکم‌گُنده

**خلۆر** / x(i)lor/: ئاوەڵناو. خلێر؛ خلار؛ خللۆر؛ گلار ☰ غلت

▣ **خلۆر کردنەوە**: خل کردنەوە ☰ غلت دادن

**خلۆرته** / x(i)lorte/: ناو. لوڕ؛ کیسە تەلیسێکی پووش تێ‌ئاخنراوی دوو تایە لە بن جلەوە لە پشتی بارەبەر دەکرێ ☰ بالشتک مانند زیر جُل باربر

**خلۆرک** / x(i)lorik/: ناو. ۱. گلێرکە؛ تەرزەی ورد ۲. پەڵوولە؛ شیوی گزمووڵە هەویر و سەوزی ☰ ۱. تگرگ ریز ۲. آش اوماج

**خلۆرەوەبوو** / x(i)lorewebû/: ئاوەڵناو. گلاو؛ تلیاگ ☰ غلتیده

**خلۆریگ** / x(i)lorîg/: ناو. گلێرکە ☰ تگرگ ریز

**خلۆز** / x(i)loz/: ناو. خەڵووز؛ ڕەژی؛ ڕەژوو؛ سوخاڵ ☰ زغال

**خلۆلک** / x(i)lolik/: ناو. ۱. بڕێش؛ شلێوە؛ دوودانگ؛ باران و بەفر پێکەوە ۲. چاوڕەشۆک؛ گوڵێکە ☰ ۱. بارش دودانگ ۲. گلی است

**خلۆلیک** / x(i)lolîk/: ناو. گلێرکە؛ تەرزەی وردیلە؛ تەیرۆکی هوور ☰ تگرگ ریز

**خلوته** / x(i)lûte/: ☜ **خلّوك**

**خلور** / x(i)lûr/: ناو. تلار ☰ غلت

**خله**[1] / x(i)le/: ناو. هەر شتی خواردنی کە منال خۆشیان لێ دێ، وەک نوقڵ و ... ☰ تنقّلات

**خله**[2]: دەنگەناو. دەنگی بەربوونی تراو لە ناو بۆشاییدا ☰ صدای عبور مایع از جسم کاواک

**خلەپۆرت / x(i)leport/**: ناو. ئاپۆرە؛ دۆخی کۆ بوونەوەی حەشامات ☰ ازدحام

**خلەخل**[1] **/ x(i)lexil/**: ناو. *[کنایە]* غلەغل؛ خلەخلێ؛ ڕەوتی تلاوتل ڕۆیشتنی تازە پاگرتوو ‹وا بە خلەخل نیسانەکەش هات/ چارشێوی سەوزی پۆشیوە ولات «پیرەمێرد»› ☰ فرایند تلوتلو خوردن نوپا

**خلەخل**[2]: دەنگەناو. غلەغل؛ خلە؛ دەنگەدەنگی گەڕانی شتێ لە بۆشاییدا ☰ صدای متمادی عبور چیزی از جسم کاواک

**خلەخلکەر / x(i)lexilker/**: ناو. نوکوچەک؛ خڕەخڕکەر ☰ لق ـ لق‌زن

**خلەخلێ / x(i)lex(i)lê/**: ☜ **خلەخل**[1]

**خلەوخەرمان/ x(i)lewxerman/**: ☜ **خەلەوخەرمان**

**خلی / x(i)lî/**: ئاوەڵناو. سست و لەش‌داهێزاو ☰ وارفته

**خلیان / xilyan/**: چاوگ. خلیانەوە؛ خلۆر بوونەوە ☰ غلتیدن

**خلیانەوە / xilyanewe/**: ☜ **خلیان**

**خلیچک / x(i)lîçik/**: ئاوەڵناو. ١. شل و ول؛ نەبەگە؛ خاو؛ خۆنەگرتوو ٢. لیچق؛ لینج ‹بامیەکەی زۆر خلیچکە، ناخورێ› ☰ ١. شُل‌وول ٢. لَزج

**خلیزە / x(i)lîze/**: ناو. شیرەی گیایەکە بە دەستەوە دەنووسێ ☰ شیرەی چسبناک گیاهی است

**خلیسک**[1] **/ x(i)lîsk/**: ناو. خولیسک: ١. خلیسکێن؛ ڕووبەرێکی لووس و لێژ بۆ خزینی شتێک لە سەری ٢. جێگەی لووس؛ جێگەی شەمتین ☰ ١. سُرسُرە ٢. لخشَک

**خلیسک**[2]: ئاوەڵناو. ١. خولیسک؛ لیچق ‹تامێکی خاو و خلیسکی هەیە› ٢. *[پلار]* گچکەی هیچ لێ نەهاتوو ☰ ١. لزج و نامطبوع ٢. کوچک ناتوان

**خلیسکان / x(i)lîskan/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //خلیسکای؛ دەخلیسکێی؛ بخلیسکێ// خلیسکیان؛ خیلیسکان؛ خەشکین؛ شەمتین؛ ڕەت بردن لە سەر شتی خز ☰ لغزیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: خلیسکاو/ چاوگی نەرێنی: نەخلیسکان

**خلیسکاندن / x(i)lîskandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //خلیسکاندت؛ دەخلیسکێنی؛ بخلیسکێنە// خەشکاندن؛ ڕەت پێدان لە سەر سەهۆڵ و... ☰ لغزاندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەخلیسکاندن

**خلیسکانێ / x(i)lîskanê/**: ناو. خلیسکێن؛ خلیسکێ؛ خزخزان؛ خزخزەکانێ؛ خلووزگێ: ١. خشخشان؛ کایەیێکی منداڵانە بە شێوەی خۆ خزاندن بە سەر شوێن یان کەرەسەیەکی تایبەتی ئەو کارەدا ٢. یاری خزان بە سەر سەهۆڵ و بەفردا ☰ ١. سُرسُرەبازی ٢. اسکی

**خلیسکاو / x(i)lîskaw/**: ئاوەڵناو. سەرگرتە؛ شەمتی؛ خزیاگ ☰ لیزخوردە

**خلیسکە / x(i)lîske/**: ناو. ١. جێگەی خلیسکان ٢. خسک؛ خسکە؛ وردەپیواز بۆ چاندن ☰ ١. جای سُر خوردن ٢. پیاز ریز کاشتنی

**خلیسکێ / x(i)lîskê/**: ناو. کاڵی؛ خاوی ☰ خامی

**خلیسکیان / x(i)lîskyan/**: ☜ **خلیسکان**

**خلیسکێن**[1] **/ x(i)lîskên/**: ☜ **خلیسکانێ**

**- خلیسکێن**[2]: پاشەوشە. خلیسکێنەر ☰ لغزانندە

**خلیسکێنکەر / x(i)lîskênker/**: ناو. کاشیکان ☰ اسکی‌باز

**خلیسکێ / x(i)lîskê/**: ☜ **خلیسکانێ**

**خلێ / x(i)lê/**: ناو. لەیستۆکی بچووکان؛ شتێ کە منداڵی پێوە دەخافڵێ ☰ سرگرمی کودکان

**خلێر / x(i)lêr/**: ☜ **خلۆر**

⊡ **خلێرەوە بوون**: گلار بوونەوە ☰ به پایین غلتیدن

**خلێرەوە کردن**: ١. خلۆر کردنەوە ٢. خڕ کردنەوە

🇮🇷 ١. به پايين غلتانيدن ٢. گرد كردن

**خلێران** / x(i)lêran/: چاوگ. تلاوتل كردن؛ تل بردن؛ تل‌دان 🇮🇷 تلو خوردن

**خلێره** / x(i)lêre/: ناو. ١. پۆلكه؛ گاگۆز؛ بەری گيايەكی كەلووداره وەک ماشی درشت دەچێ ٢. گزمووله‌قوڕی سووره‌وه‌كراو ٣. خەرخودا؛ داپيرۆشك؛ داپيرۆكه؛ پيرێژنۆكه؛ پيرايشۆكه؛ پووراشێوكه؛ پيرۆشک؛ مامەخۆڵينه؛ شەگورگانه؛ تيتگەشوانه؛ چوس‌گورگ؛ كەرەجنه؛ هەرله؛ هەڕله؛ گەنەكەوله؛ كەرەكەوله؛ خڕخاكی؛ مەل‌خاكی؛ جانەوەرێكی بۆر و خڕكەڵه، به لەشی ئالقه‌ـ ئالقه، بێ قاپوولكه و زگی كورت و پێی زۆرەوه، گڵ له سەر كونەكەی هەڵدەداتەوه 🇮🇷 ١. خلر ٢. گلوله‌ی گلی سرخ شده ٣. خرخاكی

**خلێڵه** / x(i)lêłe/: ☜ **خلێڵه**

**خلێنكه** / x(i)lênke/: ناو. گووخلێنكه؛ گووخلێنه؛ گووگلێن؛ گووگلێنه؛ گووگەڕين؛ گووخرتەوكەره؛ گووبەره؛ گام‌گلۆس؛ گی‌گلوو؛ گی‌گله؛ گووپلدەر؛ گی‌پلدەره؛ ڕيخ‌گلێنه؛ كێز؛ كێزک؛ گاوزالک؛ گازولک؛ قالۆنچەعەجەمانه؛ چۆسله؛ گازوولک؛ مێروويەكی لەش‌پان و قاپلۆخ‌ڕەق له تيرەی قالۆچه كه پێگەيوەكانيان گزمووله‌ی شياكه بۆ گەرا تێكردن خڕ دەكەنەوه 🇮🇷 سرگين‌غلتان

**خلێنه** / x(i)lêne/: ناو. ١. كاكيله؛ خڕێ؛ خرێنه ٢. ئامرازی ماستاو كردن ٣. كەمێل؛ سلەمەڕی به پاشلی مەڕەوه وشكەوەبوو ٤. گشتەكی جەواڵ دروون ٥. پارچه بەردی بچووک له بەردكاری وەستای بەنادا 🇮🇷 ١. دندان آسيا ٢. وسيله‌ی دوغ به هم زدن ٣. گال؛ سرگين خشک‌شده بر دنبه‌ی گوسفند ۴. رشته‌ی جوالدوزی ۵. تكه سنگ كوچک در كار بنايی

**خلێنەوبلێنه** / x(i)lênewb(i)lêne/: ناو./ پ‌لار/ كەين‌وبەين؛ خرتی‌وپرتی ‹ديارە خلێنەوبلێنەيەكيان له نێوانداييه!› 🇮🇷 رابطه‌ی محرمانه

**خلێوخاو** / x(i)lêwxaw/: ناو. زيگزاگ؛ لابەلا 🇮🇷 زيگزاگ

**خلافان** / x(i)łafan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //خلافای؛ دەخلافێی؛ بخلافێ// خلەفان: ١. خەريک بوون به كارێكەوه ٢. فريو خواردن؛ هەڵخەڵەتان 🇮🇷 ١. سرگرم شدن ٢. فريب خوردن

■ ناوەڵناوی بەركاری: خلافاو/ چاوگی نەرێنی: نەخلافان

**خلافاندن** / x(i)łafandin/: چاوگ. تێپەڕ. //خلافاندت؛ دەخلافێنی؛ بخلافێنه// خلافانن؛ خلەفاندن: ١. خەريک كردن ٢. فريو دان 🇮🇷 ١. سرگرم كردن ٢. فريب دادن

■ ناوەڵناوی بەركاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەخلافاندن

**خلافانن** / x(i)łafanin/: ☜ **خلافاندن**

**خلافنای** / x(i)łafnay/: چاوگ. خەريک كردن 🇮🇷 سرگرم كردن

**خلافيای** / x(i)łafyay/: چاوگ. خەريک بوون 🇮🇷 سرگرم بودن

**خلافيو** / x(i)łafîw/: ناوەڵناو. فريودراو؛ خەڵەتاو؛ دەسخەڕۆ 🇮🇷 فريب‌خورده

**خلت** / xiłt/: ناو. ١. تلف؛ تلپه؛ تلته؛ سلپ ٢. نەخۆشی نەناسراو 🇮🇷 ١. تُفاله ٢. بيماری ناشناخته

**خلتان** / xiłtan/: ناوەڵناو. گەوزيو؛ شەلاڵ 🇮🇷 آغشته

⊡ **خلتانی خوێن بوون**: له خوێندا گەوزين؛ شەلاڵی خوێن بوون ‹گەڵێ خونچەی نەپشكووتوو/ خلتانی خوێن بوو «شێركۆ»› 🇮🇷 غرق در خون بودن

**خلته** / xiłte/: ناو. ١. تلته؛ خلت ٢. قورم و سيانی ناو سەبيله و دارجگەره 🇮🇷 ١. تُفاله ٢. جرم چوب سيگار

**خلخاڵ** / xiłxał/: ☜ **خرخاڵ**

**خلّم** / xiłm/: ناو. چلّم ≡ آب‌دماغ

**خلّمن** / xiłmin/: ناو. چلّمن ≡ خلمو

**خلّۆپـان** / x(i)łopan/: چـاوگ. تـلان؛ تلانـه‌وه ≡ غلتیدن

**خلّـۆک** / x(i)łok/: نـاو. خلّـۆکه؛ خلووتـه؛ قرقـره؛ غه‌رغه‌ره؛ مه‌کاره ≡ قرقره

**خلّۆکه** / x(i)łoke/: ☜ **خلّۆك**

**خلّوزگێ** / x(i)łûzgê/: ☜ **خلیسکانێ**

**خلّـه‌تان** / x(i)łetan/: چـاوگ. خلّـه‌تیان؛ هه‌لّخه‌لّه‌تان؛ فریو خواردن ≡ فریب خوردن

**خلّه‌تاندن** / x(i)łetandin/: چاوگ. خلّه‌تانن؛ فریو دان ≡ فریب دادن

**خلّه‌تانن** / x(i)łetanin/: ☜ **خلّه‌تاندن**

**خلّـه‌تیاگ** / x(i)łetyag/: ناوه‌لّـناو. هه‌لّخلّـه‌تاو؛ فریوخواردوو؛ ده‌سخه‌رۆکراو ≡ فریب‌خورده

**خلّه‌تیان** / x(i)łetyan/: ☜ **خلّه‌تان**

ـــ **خلّـه‌تێن** / x(i)łetên/: پاشه‌وشـه. فریـودەر ‹پیاوخلّه‌تێن› ≡ ـ فریب

**خلّه‌فان** / x(i)łefan/: ☜ **خلّافان**

**خلّه‌فاندن** / x(i)łefandin/: ☜ **خلّافاندن**

**خلّـه‌فاو** / x(i)łefaw/: ناوه‌لّـناو. هه‌لّخلّـه‌تاو؛ هه‌لّخه‌لّه‌تاو ≡ فریب‌خورده

**خلّه‌وه** / x(i)łewe/: ☜ **خه‌ریوه**

**خلّێف** / x(i)łêf/: نـاو. ۱. تـوێخ؛ تـوێژێ کـه لـه پێسـتی گیانـدار هه‌لّـده‌بێ ۲. پلـووره؛ مالّـی مێشه‌نگوین ≡ ۱. پوسته‌ی نازکی که جانور می‌اندازد ۲. کندوی عسل

**خلّێفه** / x(i)łêfe/: ناو. په‌پکه ≡ چنبره

⊡ **خلّێفه خواردن**: په‌پکه دان ≡ چنبره زدن

**خلّێلـه** / x(i)łêłe/: نـاو. خلێلّـه؛ خه‌لێلّـه: ۱. دلّـه‌خورپه؛ دلّـه‌ڕاوکێ ۲. دوودلّـی؛ گومـان؛ ناخاترجه‌می ۳. دوخمانی؛ ناپاکی ≡ ۱. دلشوره ۲. تردید ۳. خیانت

**خم**[1] / xim/: ناو. ۱. هه‌ش؛ به‌ری گیایه‌که، خـام و به‌نی پێ شین ده‌کـه‌ن ۲. ده‌فـری گـه‌وره ≡ ۱. نیل ۲. خُم

⊡ **خم شێوان**: *[کینایه]* خم شـێویان؛ خـوم شـێوان؛ ئاژاوه و پشێوه بوون ≡ آشوب و بلوا شدن

**خم شێویان**: ☜ **خم شێوان**

**خم کردن**: هنگ کردن؛ لووت سـڕین؛ کـه‌پۆ لـه چلّم پاک کردنه‌وه ≡ فین کردن

**خـم لێشێوان**: *[کینایـه]* سـه‌رگه‌ردان بـوون ≡ سرگردان شدن

**خم**[2]: ده‌نگ. هنگ؛ ده‌نگی لووت خالّـی کـردن ≡ فین

**خمام** / x(i)mam/: ناو. ته‌مومژ ≡ مه

**خمچی** / ximçî/: ناو. کارگێڕی خم ≡ رنگرز

**خمخانـه** / ximxane/: نـاو. دووکـانی ڕه‌نگـڕێژی؛ دووکانی خمگه‌ر ≡ رنگرزی

⊡ **کردنـه خمخانـه‌ی که‌وو**: *[کینایـه]* سـوور و کـه‌وو کردنه‌وه‌ی له‌ش بـه لێـدان ≡ سـرخ و کبـودن کردن بدن

**خمخم**[1] / ximxim/: نـاو. خمخمـک؛ خنخنـک؛ خڕناش؛ خـه‌ڕناش؛ خووخنـک؛ کـونی کـه‌پۆ ≡ سوراخ بینی

**خم ـ خم**[2]: ده‌نگه‌ناو. خوڕـ خـوڕی ده‌نگـی ئـاو ≡ شُرـ شُر آب

**خمخمک** / ximximk/: ☜ **خمخم**[1]

**خمخمورک** / ximx(i)murik/: ناو. زه‌مینی قوپاو ≡ زمین گود

**خمخمۆته** / ximx(i)mote/: ناوه‌لّناو. گه‌نیو؛ گه‌نی؛ گه‌ند ≡ گندیده

**خمخمـۆک** / ximx(i)mok/: نـاو. قـمقمـۆک؛ خمخمۆکه؛ خومخمـۆک؛ خمـه‌گرۆ؛ خه‌مـه‌گرۆ؛ خه‌مـه‌گروو؛ خه‌مه‌گـروو؛ قومقومـه؛ بـزن‌مـژه ≡ بُزمجه

**خمخمۆکە** / ximx(i)moke/: ☜ **خمخمۆك**

**خمخـۆرك** / ximxorik/: نـاو. ١. زەوی قوپـاو؛ هەردی ڕۆچوو ٢. کەندەلان ▪ ١. زمین گود شـده ٢. کنارەی بلند آبکند

**خمخۆرکە** / ximxorke/: ناو. کەندالـی پچـووکی ئاودڕ ▪ آبکند کوچک

**خمخۆڵ** / ximxoł/: ناو. وڕاوە؛ وڕینە ▪ هذیان

**خمرەشـۆک** / ximreşok/: نـاو. خەمرەشـۆک؛ گیایەکی نزمە، گوڵی ڕۆش دەردەکات ▪ گیـاهی است

**خمسە** / ximse/: نـاو. کیلـە؛ پێوانـەی دەخـڵ ▪ پیمانەی محصول

**خمشـێوێن** / ximşêwên/: ناوەڵنـاو. [کینایـە] خـومشـێوێن؛ خومەشـوێنکە؛ خومەشـوێنە؛ خومەشێونە؛ ئاژاوەچی ▪ آشوبگر

**خمگەر** / ximger/: ناو. وەستای ڕەنگرێژ ▪ رنگرز

**خمڵ** / xim(i)ł/: ناو. مەزندە؛ مەزننە ▪ تخمین

◘ **خمڵ خستن**: مەزندە کردن بـە چـاو ▪ تخمـین زدن

**خمڵخەر** / x(i)miłxer/: ناو. مەزندەکار ▪ تخمین‌زن

**خمەکێوی** / x(i)mekêwî/: ☜ **خمەهەردە**

**خمەگرۆ** / x(i)meg(i)ro/: ☜ **خمخمۆك**

**خمەهـەردە** / x(i)meherde/: نـاو. خمـەکێوی؛ وسمە؛ ڕووەکێکی کێـوی و خۆڕسـکە لـە ڕەگ و ڕیشەکەی ماکێکی ڕەنگی بەرهەم دێنن ▪ وسمە

**خمی** / ximî/: ناوەڵناو. خمـین؛ شـین لـە ڕەنگـی هەش ▪ نیلی‌رنگ

**خمین** / ximîn/: ☜ **خمی**

**خن** / xin/: دەنگەناو. دەنگی هەناسە دان ▪ صدای نفس کشیدن

**خناف** / x(i)naf/: ☜ **خوناف**

**خناق** / x(i)naq/: ناو. ئەڵقەڕیز؛ شەوژەن ▪ چفت

**خنـاک** / x(i)nak/: نـاو. ١. تـوق لـە ملـدا ٢. گەردانەی یەکپارچە ▪ ١. طـوق گـردن ٢. نـوعی گردنبند

**خنانەوە** / x(i)nanewe/: چاوگ. پێکەنینی نـەرم؛ بە سەورێ پێکەنین ▪ آرام خندیدن

**خناو** / x(i)naw/: ☜ **خوناف**

**خناوکە** / x(i)nawke/: نـاو. گورچـک؛ گورچیلـە؛ گرچوو؛ گورچەویلە؛ ولک ▪ کلیه

**خنتولە** / xintûle/: ناوەڵناو. کروشمە؛ مـات و خـۆ خڕداو ▪ کزکردە

**خنج** / xinc/: ناو. خنجکە؛ ناز؛ قەمزە ▪ ناز؛ کرشمە

**خنجک** / xincik/: ناو. کۆلیت؛ کۆخ ▪ کوخ

**خنجکان** / xinc(i)kan/: چاوگ. خەندقین؛ خنکان ▪ خفە شدن

**خنجکانـدن** / xinc(i)kandin/: چـاوگ. خنکانـدن؛ خەندقاندن ▪ خفە کردن

**خنجکە** / xinc(i)ke/: ☜ **خنج**

**خنجوخۆڵ** / xinc û xoł/: ☜ **خنجومنج**

**خنجومنج** / xinc û minc/: ناوەڵناو. خـنجوخـۆڵ؛ جوانی نازەنین ▪ زیبا و دلربا

**خنجولک** / xincûlik/: ☜ **خنجیلانە**

**خنجەر** / xincer/: ☜ **خەنجەر**

**خنجـەرە** / xincere/: نـاو. تیشـەبەردی پـەنا قـەبر نیشانەی پیاو بوونی مردوو ▪ تکە سنگ کنار قبـر بە نشانەی مذکر بودن میت

**خنجەلە** / xincele/: ☜ **خنجیلانە**

**خنجیلانە** / xincîlane/: ناوەڵناو. خنجەلە؛ خنجیلە؛ خونجیلانە؛ خونجیلـە؛ خنجوولـک؛ خونچیلانـە؛ خونچیلە؛ چکۆلـەی جوانکیلـەی خـوێن‌شـیرین (بیری لێ بکە! ماڵێکی خـۆش و خنجیلانـە، کـوڕ و کچی جوان! «سوارە») ▪ کوچکِ زیبا

**خنجیلە** / xincîle/: ☜ **خنجیلانە**

**خنجێر** / xincêr/: ☜ **خەنجەر**

**خنچکە** / xinç(i)ke/: ناو. لەنجە و لار ▪ خرام

**خنخنك** / xinxink/: ☜ **خمخم**[1]

**خندڕك** / xindiřik/: ناو. ئاودڕ ☰ آبكند

**خنران** / xinran/: ☜ **ئاخنران**

**خنز** / xinz/: ئاوەڵناو. خوێڕی؛ ترسەنۆك؛ ترسەزاڵ ☰ ترسو؛ بُزدل

**خنز**[1] / xiniz/: ئاوەڵناو. دڕ و شەڕانی (بۆ سەگ) ‹سەیێ مە خنزە!› ☰ گزندە (سگ)

**خنز**[2]: ئاوەڵكار. بە دزییەوە؛ بێدزیەو؛ بە دزیكەوە ☰ دزدكی

**خنكان** / xinkan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //خنكای؛ دەخنكێ؛ بخنكێ// خنكیان: ١. خنجكان؛ پشوو لێ بڕان؛ هەناسە نەمان ‹عولەمامان بە قەولی بێ سەر و پا/ پاكی خنكا لە بەحری وشكی هەوا! «حاجی قادر»› ٢. مردن لە ناو ئاودا ☰ ١. خفە شدن ٢. غرق شدن

■ ئاوەڵناوی بەركاری: خنكاو/ چاوگی نەرێنی: نەخنكان

**خنكاندن** / xinkandin/: چاوگ. تێپەڕ. //خنكاندت؛ دەخنكێنی؛ بخنكێنە// خنكانن: ١. خنجكاندن؛ خەندقاندن؛ پشوو لێ بڕین؛ هەناسە بڕین ‹سووچت بوو فەرمووت مـن نیشتمانیم؟/ بیشمخنكێنن هەر كوردستانیم «قانع»› ٢. لە ناو ئاودا خەفە كردن ☰ ١. خفە كردن ٢. غرق كردن

■ ئاوەڵناوی بەركاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەخنكاندن

**خنكانن** / xinkanin/: ☜ **خنكاندن**

**خنكاو** / xinkaw/: ئاوەڵناو. خنكیاو؛ خنكیاگ: ١. هەناسە لێبڕاو ‹دەستی بەربووی كچی گەڕی شاییم/ هەستی خنكاوی لاوی سەوداییم «هێمن»› ٢. لە ئاودا مردوو ☰ ١. خفەشدە ٢. غرق شدە

**خنكیاگ** / xink(i)yag/: ☜ **خنكاو**

**خنكیان** / xink(i)yan/: ☜ **خنكان**

**خنكیاو** / xink(i)yaw/: ☜ **خنكاو**

**ـــ خنكێن** / -xinkên/: پاشەوشە. خنكێنەر ‹گورگخنكێن› ☰ ـ خفەكن

**خنكێندران** / xinkênd(i)ran/: ☜ **خنكێتران**

**خنكێندراو** / xinkênd(i)raw/: ☜ **خنكێتراو**

**خنكێنران** / xinkênran/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //خنكێنرای؛ دەخنكێنرێی؛ بخنكێنرێ// خنكێندران: ١. خەفە كران ٢. غەرق كران ☰ ١. خفە شدن ٢. غرق شدن

■ ئاوەڵناوی بەركاری: خنكێنراو/ چاوگی نەرێنی: نەخنكێنران

**خنكێنراو** / xinkênraw/: ئاوەڵناو. خنكێندراو؛ خنكاو: ١. هەناسە لێ بڕاو ٢. لە ئاودا مردوو ☰ ١. خفەشدە ٢. غرق شدە

**خنگڕین** / xing(i)rîn/: چاوگ. بە دڵنیاییەوە ڕۆیشتن ☰ با آرامش رفتن

**خنگلین** / xing(i)lîn/: چاوگ. ١. بە شەلەشەل ڕێوە چوون ٢. بەولاولادا كەوتن ☰ ١. لنگلنگان راە رفتن ٢. تلوتلو خوردن

**خنۆك** / x(i)nok/: ناو. قوڕگ؛ ئەوك ☰ حَلق

**خنوسی**[1] / x(i)nûsî/: ناو. كووپەی گەورەی زار زل ☰ خُم بزرگ دهان گُشاد

**خنوسی**[2]: ئاوەڵناو. گوشاد؛ هەراو ☰ گُشاد

**خنە** / x(i)ne/: دەنگەناو. هەسكەهەسك؛ دەنگی هەناسەی سوار ☰ هِن ـ هِن

**خنەخن**[1] / x(i)nexin/: ناو. هەناسەبڕكێ لە ماندوویی ☰ هِنوهِن

**خنەخن**[2]: ئاوەڵكار. بە هێواشی؛ لەسەرخۆ ‹خنەخن كار دەكا› ☰ بە كُندی

**خنیكنای** / x(i)nîknay/: چاوگ. خنكاندن ☰ خفە كردن

**خنیكیای** / x(i)nîkyay/: چاوگ. خنكان ☰ خفە شدن

**خنین** / x(i)nîn/: چاوگ. ١. پووراندن؛ ڕاپۆڕاندن؛ (تێ)پەستاندن؛ (تێ)پەستاوتن؛ تێبڕین؛

(تێ)تەپاندن ٢. پەستاوتن ☰ ١. سپوختن ٢. آکندن

**خنینەوە** /x(i)nînewe/: چاوگ. لە سەر خۆ پێکەنین؛ نەرمەخەنە کردن ☰ آرام خندیدن

**خنیە** /x(i)nye/: ☜ **خەنە-٢**

**خوا**[1] /x(i)wa/: ناو. ١. ☜ **خودا** ٢. ☜ **خوێ -١**

▣ **خوا بە گژ کەسێکدا دان**: داوا کردن لە خوا کە تووڕەیی و هەڕەشەی خۆی نیشان کەسێ بدات ☰ خشم خدا را برای کسی خواستن

**خوا پێ دان**: ☜ **خوا دان-١**

**خوا خراو بۆ کردن**: سەر لێ شێوان (زۆرتر وەکوو تووک بە کار دەڕوا) ☰ گُمراه شدن

**خوا خۆش نەهاتن**: ڕەزای خودای لەگەڵ نەبوون ☰ خدا را خوش نیامدن

**خوا دان**: ١. خوا پێدان ٢. خوێ دان بە ئاژەڵ ☰ ١. از خدا رسیدن ٢. نمک به حیوان دادن

**خوا دانەوە**: تووشی مەترسی بوونی کەسێ و دەرباز بوونی لە مەرگ ☰ مُعجزەآسا از مرگ رستن

**خوا لە بەینا بوون**: خوا پێ زانین؛ خوا وەکیل بوون؛ بە ڕاست بوون ‹خوا لە بەینا بێ دەستم لێ نەداوە› ☰ خدا شاهد بودن

**خوا لە کەسێ خۆش بوون**: خوا سووچ و گوناحی کەسێک بەخشین ☰ خدا کسی را آمرزیدن

**خوا لە کەسێ ڕازی بوون**: خودا کەسێکی خۆش ویستن ☰ خدا از کسی خشنود بودن

**خوا نەخواستە**: خوا نەخواسە؛ خوا نەکا؛ خوا نەکردە؛ ڕوو نەدات ☰ خدای ناخواسته

**خوا نەخواسە**: ☜ **خوانەخواستە**

**خوا نەکا**: ☜ **خوانەخواستە**

**خوا نەکردە**: ☜ **خوانەخواستە**

**خوا هەڵنەگرتن**: خوا خۆش نەهاتن؛ کاری دوور لە ڕەزای خوا کردن ☰ خدا راضی نبودن

**خوا یار(ی کەسێ) بوون**: خوا یاریگەر بوون ‹خوا یارمان بێ ئیسماڵ کارەکە تەواو ئەکەین› ☰ خدا یار بودن

**خوای خۆ بە حەق نەناسین**: *[کنایە]* لە خۆ بایی بوون؛ خۆپەسێن و خۆسەپێن بوون ‹لە کاتێکەوە بووەتە سەرۆک، خوای خۆی بە حەق ناناسێ› ☰ خدا را بنده نبودن

**تا خوا حەز کردن**: زۆر - زۆر بوون؛ یەکجار زۆر بوون؛ زێتر لەو ڕادە بوون بیری بۆ بچێ ‹حەمەحوسێن خان کوڕی سەیفی قازی و ئامۆزای پێشەوا بوو. پیاوێکی سوورهولی زۆر زەلامی چاوزەق و بەهەیبەت بوو. تا خوا حەز کا کوردێکی دڵسۆز بوو. «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ بیش از حد

**کردنە خاتر خوا**: بۆ ڕەزای خوا؛ بە خاتری خوا ☰ محض رضای خدا

**• خوا**[2]: پاشەوشە. ـ خواز؛ ـ خواه؛ داواکار ☰ ـ خواه

**خوا**[3]: ئامراز. یان؛ یا؛ نا ‹ئووشن هەر ڕووژی دیزە نیەیتە دار/ خوا ئەڕای شام بوو، خوا ئەڕای نەهار/ خوا گووشت گاپیر، خوا شەک پەروار «شامی»› ☰ خواه

**خوابەختەکی** /x(i)wabextekî/: ئاوەڵکار. شانسی؛ خۆوبەخت؛ بەهەڵکەوت ☰ شانسی

**خوابیکا** /x(i)wabîka/: ☜ **خواحەزکا**

**خواپەرس** /x(i)waperis/: ☜ **خواپەرست**

**خواپەرست** /x(i)waperist/: ئاوەڵناو. خواپەرس؛ خوداپەرس؛ خوداپەرست؛ پەرستندەی خودا ☰ خداپرست

**خواپێداگ** /x(i)wapêdag/: ☜ **خواپێداو**

**خواپێداو** /x(i)wapêdaw/: ئاوەڵناو. خواپێداگ؛ بەختەوەر؛ بەسعوود ‹چونکە ئەیزانم تەلاری یارە خواپێداوەکەت/ مەستی کردووی بۆیە نابینێ لە عاستم چاوەکەت «هەردی»› ☰ خداداده

**خوات** /x(i)wat/: ئاوەڵناو. قایم؛ توند ☰ محکم

**خواتۆبە** /x(i)watobe/: سارستە. پەنابەخوا ☰ پناه

بر خدا

**خواتیەلە** / x(i)wat(i)yele/: ناو. خوێ تاڵە ☰ نمک تلخ

**خواجا**[1] / x(i)waca/: ناو. خواجە: ١. نازناوێک بۆ جوولەکە و گاوری دەوڵەمەند ٢. نازناوی مەلا و مامۆستا ٣. *[مەجاز]* دەوڵەمەند؛ بوودە؛ دارا ☰ ١. لقب کلیمی و مسیحی ثروتمند ٢. لقب ملا و استاد ٣. دارا

**خواجا**[2]: ئاوەڵناو خواجە؛ خەسێنراو ☰ اختەشدە

**خواجارۆ** / x(i)wacaro/: ☜ **خەجەرۆ**

**خواجانشین** / x(i)wacan(i)şîn/: ☜ **خواجانە**

**خواجانە** / x(i)wacane/: ناو. خواجەنشین؛ خواجانشین؛ دوو سەکۆی هەر دوو لای دەرک و دەروازەی ماڵەگەورەی پێشوو ☰ دو سکوی دو طرف دروازەهای قدیم

**خواجە** / x(i)wace/: ☜ **خواجا**

**خواجەبێدار** / x(i)wacebêdar/: ناو. ئاڵقەی لە دەرگا دان ☰ حلقەی در

**خواجەنشین** / x(i)wacen(i)şîn/: ☜ **خواجانە**

**خواحافیز** / x(i)waĥafîz/: دۆعا. خوداحافیزی؛ مالاوا؛ خاترێ وە؛ لە پەنای خوا؛ خوا پارێزەر بێت (کاتی جوێ بوونەوە لە کەسێ، بۆ مالاوایی دەگوترێ) ☰ خداحافظ

**خواحافیزی** / x(i)waĥafîzî/: ناو. مالاوایی؛ خاترخوازی؛ ڕێوڕەسمێ کە لە کاتی ڕۆیشتنی کەسێ لە شوێنێک بەڕێوە دەچێ ☰ خداحافظی

**خواحەزکا** / x(i)waĥezka/: سارستە. خوابیکا؛ لە سەر خودا ☰ انشاءالله

**خواخوا**[1] / x(i)wax(i)wa/: ☜ **خوداخودا**

⊡ **خواخوا بوون**: ☜ **خوداخودا بوون**

**خواخوا**[2]: ئاوەڵناو. خوداخواز؛ خواپەرست ☰ خداپرست

**خوادا** / x(i)wada/: ☜ **خواداو**

**خواداد** / x(i)wadad/: ☜ **خواداو**

**خواداگ** / x(i)wadag/: ☜ **خواداو**

**خوادان** / x(i)wadan/: ناو. ١. ☜ **خوێدان** ٢. کیسەیەکی قایم بوو بۆ جێی خوێ ☰ ١. ☜ **خوێدان** ٢. کیسەی جانمکی

**خواداو** / x(i)wadaw/: ناو. خوادا؛ خواداد؛ خواداگ؛ بەشی خوایی ☰ خداداد

**خوار**[1] / x(i)war/: ناو. ١. لای ژێر. بەرانبەر: **بان** ‹لارەی سەری تی لە ناو خیابان/ لە بان دەیدە خوار، لە خوار دەیدە بان «شامی»› ٢. خوشک؛ خوەیشک ☰ ١. پایین ٢. خواهر

**خوار**[2]: ئاوەڵناو. لار: ١. چەوت؛ کەج ٢. *[مەجاز]* ناڵەبار لە دۆستی و مامەڵەدا ☰ ١. کج ٢. کجحساب

⊡ **خوار بوونەوە**: لارەوە بوون؛ داهاتن ☰ خم شدن

**خوار کردن**: لار کردن؛ چەماندن ‹گوێی لە سێوەڕە گرتووە/ ملی لە سەر خوار کردووە «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ خم شدن

**خواربڕاو** / x(i)warb(i)řaw/: ئاوەڵناو. خواربڕدراو؛ شەفتووربڕیاگ ☰ فارسی‌بُر

**خواربڕدراو** / x(i)warbiřd(i)raw/: ☜ **خواربڕاو**

**خواردن**[1] / x(i)wardin/: چاوگ. تێپەڕ. تێنەپەڕ. //خواردت؛ دەخۆی؛ بخۆ// خوارن؛ خارن؛ وەردش؛ وەردایش؛ واردەی؛ هەردن؛ هەردەن: ☐ تێپەڕ. ١. قووت دانی پێخۆر لە ڕێی گەرووەوە بۆ ناو گەدە ‹نان خواردن› ٢. خواردنەوە؛ فڕ کردن ‹ئاو خواردن› ٣. داگیر کردن؛ بە ناڕەوا خۆ کردنەوە خاوەنی شتێک ‹ماڵی خەڵک خواردن› ٤. مەزخاندن؛ خەرج کردن؛ باخت کردن ‹چی بە میرات بۆ مابوو لە ساڵێکدا خواردی› ☐ تێنەپەڕ. ٥. لێ کەوتن ‹دەستم خواردی بەو لیوانە› ٦. *[مەجازی]* کەوتنە بەر تین و تەوژمی شتێک ‹خەم خواردن› ٧. *[مەجازی]* پێ کەوتن؛ لێهاتن ‹ئەو ڕەنگەی پێ

نەخوا› ٨. *[مەجازی]* وەرگرتن؛ قبووڵ کردن ‹جۆش خواردن؛ پووڵ خواردن› ٩. بەرکەوتن ‹شەق خواردن؛ کوتەک خواردن› ☰ ١تا٩. خوردن
■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەخواردن

**خواردن**[٢]: ناو. خۆراک؛ چێشت ☰ خوراک

**خواردنگە** / x(i)wardinge/: نا. خارنگە؛ خوارنگەھ؛ چێشتخانە؛ شوێنی تایبەت بۆ خواردن و خواردنەوە بە پارە ☰ غذاخوری

**خواردنەوە**[١] / x(i)ward(i)newe/: چاوگ. تێپەڕ. //خواردتەوە؛ دەخۆیەوە؛ بخۆ(ر)ەوە// خوارنەوە؛ نۆشین؛ وەخوارن ‹ئاو خواردنەوە› ☰ نوشیدن
■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەخواردنەوە

**خواردنەوە**[٢]: ناو. خوارنەوە؛ هەر شتێکی تراو کە بۆ خواردن بشێت ☰ نوشیدنی

**خواردنەوەیی** / x(i)ward(i)neweyî/: ناو. قەخار؛ شتی بۆ خواردنەوە ☰ نوشیدنی

**خواردنی** / x(i)ward(i)nî/: ☜ **خواردەمەنی**

**- خواردوو** / x(i)wardû-/: پاشوشە. ١. بەر خواردن کەوتوو ‹کرمخواردوو› ٢. دەرخوارددراو ‹دەرمانخواردوو› ☰ ١. خوردەشدە ٢. خوراندەشدە

**خواردە** / x(i)warde/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* ١. بەخشندە؛ دەسبڵاو ٢. خۆشخۆر ☰ ١. سخاوتمند ٢. خوشخوراک

**خواردەس** / x(i)wardes/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* خواردەست؛ ژێردەست؛ بەردەست ☰ زیردست

**خواردەست** / x(i)wardest/: ☜ **خواردەس**

**خواردەمەنی**[١] / x(i)wardemenî/: ناو. خواردنی؛ چەرە؛ خۆرەن؛ پێخۆر؛ ئەوی وەک چێشت یان چەرە کە بۆ خواردن دەبێ ☰ خوراکی

**خواردەمەنی**[٢]: ئاوەڵناو. خواردنی؛ شیاوی خواردن ‹ئەم گیایە خواردەمەنی نییە› ☰ خوردنی

**خوارزا** / x(i)warza/: ☜ **خوشکەزا**

**خوارزی** / x(i)warzî/: ☜ **خوشکەزا**

**خوارزینە** / x(i)warzîne/: ناو. ژنخوشک؛ خوشکی ژن ☰ خواهرزن

**خوارک** / x(i)wark/: ناو. ١. شیلە؛ ددانی شیری ٢. پوور؛ میمک ٣. خوشکی دایک ☰ ١. دندان شیری ٢. عمّە ٣. خالە

**خوارکە** / x(i)warke/: ناو. دروومانی پێچەلپلۆچ ☰ دوختودوز حلزونی

**خوارگ** / x(i)warig/: ☜ **خوارو**

**خوارگین** / x(i)wargîn/: ☜ **خوارو**

**خوارن** / x(i)warin/: ☜ **خواردن**

**خوارندن** / x(i)warindin/: چاوگ. ورنای ☰ خاراندن

**خوارنگ** / x(i)waring/: ☜ **خوارو**

**خوارنگەھ** / x(i)waringeh/: ☜ **خواردنگە**

**خوارنەوە** / x(i)warnewe/: ☜ **خواردنەوە**

**خواروا** / x(i)warwa/: ناو. بنژیل؛ بن بێژنگە ☰ تەنشین غربالشدە

**خواروخێچ** / x(i)war û xêç/: ئاوەڵناو. خواروویچ؛ خێچوپاچ؛ خێچوخوار؛ چەفتوچەوێل؛ چەوتوچێل؛ لار و خوار ☰ کج و کولە

**خواروویچ** / x(i)war û wêç/: ☜ **خواروخێچ**

**خواروخ** / x(i)warox/: ئاوەڵناو. زۆرخۆر؛ فرەخوەر ☰ پُرخور

**خوارو** / x(i)warû/: ئاوەڵناو. خوارگ؛ خوارگین؛ خوارنگ؛ خواری؛ خوارین؛ لای ژێروو ‹گوندی خواروو› ☰ پایینی

**خوارەبا** / x(i)wareba/: ناو. لابا؛ بایەک کە نە شەماڵ بێ نە زریان ☰ بادی نە از سمت جنوب و شمال

**خوارەپێچە** / x(i)warepêçe/: ☜ **خوارەکەوپێچەکە**

**خوارەخوار** / x(i)warex(i)war/: ☜ **خوارەوخوار**

**خوارەکەوپێچەکە** / x(i)warekewpêçeke/: ئاوەڵناو. خوارەپێچە؛ قیلقاج؛ خوارەپێچە ☰ اُریب

**خوارەمڕێ** / x(i)warem(i)řî/: ناو. ئاژاوە؛ پشێوێنی ☰ آشوب

**خوارەوخـــوار** / x(i)warewx(i)war/: ئاوەڵـــناو. خوارەخوار؛ بەرەولا؛ قیچەلقاچ؛ قیلەقاچ ☰ اُریب؛ کج

**خوارەوە** / x(i)warewe/: ئاوەڵکار. لای ژێروو ‹چوو لە خوارەوە دانیشت› ☰ پایین

**خواری**[1] / x(i)warî/: ناو. لاری؛ چەوتی؛ ناڕاستی ☰ کجی

**خواری**[2]: ☜ **خوارو**

**خوارین** / x(i)warîn/: ☜ **خوارو**

**خوارێ** / x(i)warê/: ئاوەڵـکار. لای خـواروو؛ لای ژێروو ☰ پایین

**ـ خـواز** / x(i)waz-/: پاشەوشـە. ـــ واس؛ داواکـــار؛ خوازەر ‹ئاواتخواز؛ ئازادیخواز› ☰ ـ خواه

**خوازبێن** / x(i)wazbên/: ☜ **خوازبێنی کەر**

**خـــوازبێنی** / x(i)wazbênî/: نـــاو. خـــــازبێنی؛ خـوازگینی؛ خـوازگێنی؛ خوازمـەنی؛ خـازگینی؛ خوازگینی؛ خوازگێنی؛ خواستمەنی؛ خوازگـاری؛ داوخـوازی: ١. هـێجبی؛ هێجـوی؛ هـەیجووی؛ داواکاری لـە کـچ یـان ژن بـۆ ژیـانی هاوبەشـی ‹لێـرەدا بـاو نییـە کـچ لـە کـوڕ خـوازبێنی بکـا› ٢. ڕێوڕەسمـی تایبـەتی داواکـاری کـچ (وەکـوو ڕۆیشتن بۆ ماڵی کچی دیاریکراو و وتوویـژ دەگـەڵ بنەماڵەیدا) ☰ ١و٢. خواستگاری

⊡ **خوازبێنی کردن**: خوازمەنی کـردن؛ داوا کـردنی کچ بۆ کوڕ ☰ خواستگاری کردن

**خـــــوازبێنیکراو** / x(i)wazbênîk(i)raw/: ☜ **خواستی**

**خوازبێنیکـەر** / x(i)wazbênîker/: نـاو. خـوازبێن؛ خوازمەن؛ خوازمەنی کەر؛ خـوازگێن؛ خوهسـتی؛ هێجبی؛ هیجووی؛ هێجیکـار؛ داواکـار؛ داواکـەر؛ خواستمەنی کەر؛ ئەوەی خوازیاری کچ یان ژنێکە (بۆ خۆی یان کەسێکی تر) ☰ خواستگار

**خوازتن** / x(i)waztin/: چاوگ. خواسـتن: ١. داوا کردن ‹ئەو چاوانە وا خوماری نازن/ بـە ئیمـا ئیمـانم دەخـوازن «وەفـایی»› ٢. ئـارەزوو کـردن ‹وەکـوو «جامی» دەڵێ، دەم وشکهەڵاتوو من سەگێکی گەڕ/ جگەر تینووم و دەخوازم نمێ لـەو بـەحری ئیحسـانە «مەحوی»› ٣. ژنێ بە هاوسەری گرتن ‹عاقیبـەت دەیخوازن ئەمما ئەو دەمی/ پـیر بـووە نـازێ کـەل و کۆمە دەمی «حاجی قـادر»› ٤. خـوازبێنی کـردن ‹هیوا کچێکی دراوسـێیانی خواسـتووە› ☰ ١. طلـب کردن ٢. آرزو کردن ٣. به زنی گرفتن ۴. خواستگاری کردن

**خوازتنـــەوە** / x(i)wazt(i)newe/: چـــاوگ. بـــە ئەمانەت وەرگرتن؛ وەرگرتن بە نیـازی دانـەوە ☰ به امانت گرفتن

**خـــوازران** / x(i)wzran/: چـــاوگ. تێنەپـــەڕ. نادیـــار. //خوازرای؛ دەخوازرێی؛ بخوازرێ// ١. داوا کران ٢. بە ئەمانەت وەرگـیران ☰ ١. خواسته شـدن ٢. بـه امانت گرفته شدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: خـوازراو/ چـاوگی نـەرێنی: نەخوازران

**خوازراو**[1] / x(i)wazraw/: ناو. بانـگ کـراو؛ ئـەوەی شکاتی لێ کراوە ☰ خوانده

**خـوازراو**[2]: ئاوەڵـناو. خـوازراوە: ١. داواکـراو ٢. بـە ئەمانـەت وەرگـیراو ☰ ١. خواستەشـدە ٢. امانـت گرفتەشدە

**خـوازراوە**[1] / x(i)wazrawe/: نـاو. خـــوازراوی: ١. خواسـت؛ داوا؛ ویسـتراو؛ ئـەوی کـە کـەس یـان دەستەیەک خوازیـارین ٢. داواکـاری؛ خواسـت؛ خـــواس؛ ئـــەوەی ســـکالابەر لـــە دادنامەکەیـــدا خوازیاریەتی ☰ ١و٢. خواسته

**خوازراوە**[2]: ☜ **خوازراو**[2]

**خوازگار** / x(i)wazgar/: ☜ **خوازەر**

**خوازگاری** / x(i)wazgarî/: ناو. ١. داوا ٢. ☜ خوازبێتی ☰ ١. طلب ٢. ☜ خوازبێتی

**خوازگین** / x(i)wazgîn/: ☜ خوازبێتی‌کەر

**خوازگینی** / x(i)wazgînî/: ☜ خوازبێتی

**خوازگێنی** / x(i)wazgênî/: ☜ خوازبێتی

**خوازلۆک** / x(i)wazłok/: ☜ خوازەڵۆك

**خوازمەن** / x(i)wazmen/: ☜ خوازبێتی‌کەر

**خوازمەنی** / x(i)wazmenî/: ☜ خوازبێتی

**خوازمەنی‌کەر** / x(i)wazmenîker/: ☜ خوازبێتی‌کەر

**خوازنامە** / x(i)wazname/: ناو. داوای کارێک بە نامە ☰ درخواستنامە

**خوازۆک** / x(i)wazok/: ☜ خوازەڵۆك

**خوازە** / x(i)waze/: ناو. ١. داخوازی ٢. *[ئەدەبی]* ئیستەعارە؛ کاری وەرگرتن؛ بە کار هێنانی ناوێک لە جیاتی ناوێکی‌تر، بە هۆی وێکچوونەوە (وەک نێرگز بۆ چاو، کەوان بۆ برۆ) ☰ ١. خواستە ٢. استعارە

**خوازەر** / x(i)wazer/: ئاوەڵناو. خوازگار؛ داواکار ☰ خواهان؛ خواستار

**خوازەکار** / x(i)wazekar/: ☜ خواسکەر

**خوازەکی** / x(i)wazekî/: ناو. داواکاری ☰ طلب

**خوازەڵۆک** / x(i)wazełok/: ئاوەڵناو. خوازۆک؛ خازۆک؛ خوازلۆک؛ خواستۆخ ☰ گدامنش

**خوازەڵۆکی** / x(i)wazełokî/: ناو. پارسە؛ سواڵ؛ گەدایی ☰ گدایی

**خوازەیی** / x(i)wazeyî/: ئاوەڵناو. وەرگرتنی ☰ استعاری

**خوازیار**[١] / x(i)wazyar/: ناو. کەسێ کە لە کەسێکی‌تر شکایەتی کردووە (خوازیار دۆسییەکەی واژۆ نەکردووە) ☰ خواهان

**خوازیار**[٢]: ئاوەڵناو. داواکار (ڕاپەڕین، یەک دەکەوین، یەک بکەوین سەردەکەوین/ گەلی ئێمەش هەموو خوازیاری هەوا و ئاو و زەوین «ئاوات») ☰ خواستار

**خواژن** / x(i)wajin/: ناو. خوای مێوینە لە ئایینە چەندپەرەستییەکاندا (ڤینووس خواژنی جوانی بوو) ☰ الاهە

**خواس**[١] / x(i)was/: ☜ خواست

**خواس**[٢]: ☜ خاوس

**خواس**[٣]: پێرز. ← باس‌وخواس

**خواسایی** / x(i)wasayî/: ئاوەڵناو. ئاسایی (کتێبەکەم بە شێوەیەکی خواسایی چاپ نەکرا و هەزار نوسخەی لێ دابەش کرا) ☰ معمولی

**خواست** / x(i)wast/: ناو. خواس؛ ویست (بە خواستی خوا) ☰ خواست

**خواستمەنی** / x(i)wast(i)menî/: ☜ خوازبێتی

**خواستمەنی‌کەر** / x(i)wast(i)menîker/: ☜ خوازبێتی‌کەر

**خواستن** / x(i)wastin/: چاوگ. تێپەڕ. //خواستت؛ دەخوازی؛ بخوازە// خازتن؛ خوازتن؛ خۆهستن؛ خووهستن: ١. گەرەک بوون ٢. بە ژنی گرتن (کچی دراوسێکەیانی خواست) ☰ ١. خواستن ٢. بە زنی گرفتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەخواستن

**خواستۆخ** / x(i)wastox/: ☜ خوازەڵۆك

**خواستە** / x(i)waste/: ئاوەڵناو. ویست؛ ویستراو؛ ئەوەی داوای لە سەرە (خوا نەخواستە) ☰ خواستە

**خواستەمەنی** / x(i)wastemenî/: ئاوەڵناو. دڵخواز ☰ دلخواه

**خواستەنی** / x(i)wastenî/: ئاوەڵناو. ١. شیاوی خواستن/ گەرەک بوون ٢. بە ئەمانەت وەرگیراو ☰ ١. خواستنی ٢. امانتی

**خواستی** / x(i)wastî/: ئاوەڵناو. خوازبێنی‌کراو؛ داوا کراو ☰ خواستگاری شدە

**خواسکەر** / x(i)wasker/: ئاوەڵناو. سواڵکەر؛ دەرۆزەکەر؛ خوازەکار ☰ گدا

**خواسی** / x(i)wasî/: ناو. ١. ☜ خەسوو ٢. پێخواسی؛ بێ‌پێڵاوی ☰ ١. ☜ خەسوو ٢.

پابرهنگی

**خوافرۆش**[1] / x(i)waf(i)roş/: ناو. خـوێفـرۆش ☰ نمک‌فروش

**خوافرۆش**[2]: ئاوەڵناو. [مەجاز] دەسبڕ و خوانـەناس ☰ کلاهبردار

**خواکرد**[1] / x(i)wakird/: ناو. کاری خـوا؛ ئـیرادەی خوا ☰ کار خدا

**خـواکرد**[2]: ئاوەڵـناو. خۆڕسـک؛ سرشـتی ‹ڕازاوەی ڕەنگی خواکردن/ لەو سەر زەماوەندە گردن «هـەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ طبیعی

**خواکەرەم** / x(i)wakerem/: ناو. کـەرەمی خـوا؛ بەخششی خودا ☰ بخشش خداوندی

**خواگرتـوو** / x(i)wagirtû/: ئاوەڵناو. [مەجاز] لێ‌قەوماو؛ بەر ڕک و کینەی خوا کەوتوو ☰ مـورد غضب خدا

**خواگیری** / x(i)wagîrî/: ناو. [کینایە] زولـم و زۆر ☰ ظلم و زور

**خواڵە** / x(i)wale/: ناو. ١. خوشـک؛ خوەیشـک؛ خوار ٢. بت؛ خوای دەستکرد ☰ ١. خواهر ٢. بُت

**خوالینە** / x(i)walîne/: ناو. ١. خوێڵـێن؛ کانگـای خـوێ ٢. کانیـاوی سـوێر ☰ ١. معـدن نمـک ٢. چشمەی آب شور

**خوالێخۆشبوو** / x(i)walêxoşbû/: ئاوەڵناو. ڕەحمەتی؛ خواعەفووکردگ ‹ئەو خوالێ‌خۆشـبووە، ڕۆژێکی خۆشی نەدی› ☰ خدابیامُرز

**خواڵێن** / x(i)wałên/: ناو. ١. کەفڵـە؛ بـەردەخوێ ٢. کانی خوێ ☰ ١. سنگ نمک ٢. معدن نمک

**خوامابەین** / x(i)wamabeyn/: دۆعا. وەکیلەڵـلا؛ خوا وەکیلە ☰ خداوکیل

**خوان**[1] / x(i)wan/: ناو. ١. جێ نیشـتنی سـوار لـە سەر زین ‹بۆ جەنگێ کە تەختی خوانـی زیـن بـوو/ ئیتر نەبەزین و دابەزین بوو «هەژار، *مەم‌وزین*»› ٢. تفال؛ سفرە ٣. تەبەک؛ تەوەق؛ دەفری تـەخت و لێوارەکورتی گەورە کە پیتەوای لە سەر دادەنـێن ٤. ئامرازێکە لە ئاسیاو ٥. پنە؛ پنێ؛ پارچە چێوی تەخت و لووسی هەویر لە سەر پـان کردنـەوە ٦. [مەجاز] میوانی ‹ئامادەی هیچکـام لـەو دوو خوانـە و دانیشتن لەگەڵ سەرۆک نەبوو› ☰ ١. خوان زیـن ٢. سُفره ٣. طبـق ۴. ابـزاری در آسیا ۵. تختـەی پهـن کردن خمیر ۶. مهمانی

- **خوان**[2]: پاشەوشـە. ١. ـ خـوێن ‹ئـاوازەخوان› ٢. ـ سفرە ‹ئێوارەخوان؛ نیوەڕۆخـوان› ☰ ١. ـ خـوان ٢. سفره

**خواناس** / x(i)wanas/: ئاوەڵناو. ئیماندار؛ بە ئیمان؛ خـاوەن بـڕوا بـە خـودا. بەرانبـەر: **خوانەناس** ☰ خداشناس

**خواناسی** / x(i)wanasî/: ناو. دۆخ یـان چۆنیـەتی بـڕوا بـە خـودا بـوون. هـەروەها: **خوانەناسی** ☰ خداشناسی

**خوانچە** / x(i)wançe/: ناو. ١. سـینی پچـووک ‹خوانچە پڕ بێ، با لە قوڕ بێ «مەسەل»› ٢. جێگەی وردەواڵەی دەسگێڕ لـە بـەر سـینگی ٣. سـینی چەند ڕەنگ لە سەر، کە بۆ ماڵی بووک دەچێ ٤. تەبـەقی گـەورە ‹ئـەم خوانچەیـە بـەرماوی هـەزار جەمشیدە/ گۆڕە و گەلێ بارامی تیـا نیـژراوە «هـەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ☰ ١. سینی کوچک ٢. سینی مانند دستفروش ٣. خوانچەی عروس ۴. طبق بـزرگ چوبی

**خوانک** / x(i)wan(i)k/: ناو. دەرخۆنە؛ سەرپۆشـی دەفر ☰ سرپوش دیگ و دیزی

**خوانکە** / x(i)wanke/: ناو. ١. خوانـک ٢. دیـزەی چکۆلەی دوو نەفەری ٣. دارێکـی ئەسـتوور کـە مووروووی ئاشی تێدایە ٤. پنەی نان کـردن ☰ ١. سرپوش دیگ ٢. دیزی کوچـک دو نفـری ٣. چـوب حاوی مُهرەسنگ آسیا ۴. تختەی پهن کردن خمیر

**خوانگ** / x(i)wang/: ناو. خوشـک؛ خوەیشـک ☰

خواهر

**خوانووس** / x(i)wanûs/: ناو. چارەنووس؛ ئاکام ☰ سرنوشت

**خوانە**[۱] / x(i)wane/: ناو. پنە؛ خوانکە؛ خوان ☰ تختەی پهن کردن خمیر

**خوانە**[۲]: ئاوەلناو. خویا؛ دیار؛ بەرچاو ☰ آشکار؛ پدیدار

**خوانەکردە** / x(i)wanekirde/: دۆعا. خوانەخواستە؛ خوانەخواستە؛ خوانەکا؛ خوا ئەو ڕۆژە نەهێنێ؛ ڕوو نەدا؛ دووروا؛ دووربا ☰ خدای نکرده

**خوانەناس** / x(i)wanenas/: ئاوەلناو. خوانەژناس؛ ناخودا؛ بێ‌بڕوا بە هەبوونی خوا «ئەتوت: ئاخ بۆ تەلێ ڕێواس/ ماندووت کردم هەی خوانەناس «پیرەمێرد»» ☰ خدانشناس

**خوانی** / x(i)wanî/: ئاوەلناو. خویا؛ ئاشکرا؛ دیار ☰ آشکار؛ پدیدار

**خواوڕاسان** / x(i)wawřasan/: ☜ **خوداوڕاستان**

**خواوەکێڵ** / x(i)wawekêł/: ئاوەلکار. خودامابەین؛ خوا لە بەینا بێ؛ لە ڕاستیدا ☰ خدا وکیل

**خواوەن** / x(i)wawen/: ناو. خواوەند؛ خوداوەند؛ خودا؛ خوا؛ بینایی چاوان ☰ خدا

**خواوەند** / x(i)wawend/: ☜ **خواوەن**

**خواه** / x(i)wah/: ☜ **خوا ـ۲**

**خواهش** / x(i)wahiş/: ☜ **خوایش**

**خواهشت** / x(i)wahişt/: ☜ **خوایش**

**خواهیش** / x(i)wahîş/: ☜ **خوایش**

**خواهیشت** / x(i)wahîşt/: ☜ **خوایش**

**خوای**[۱] / x(i)way/: چاوگ. پێکەنین ☰ خندیدن

**خوای**[۲]: ناو. خودا؛ خوا ☰ خدا

**خوایش** / x(i)wayiş/: ناو. خواهش؛ خواهیش؛ خواهیشت؛ خوایش؛ خوایشت؛ تکا؛ کار و ڕەوتی ویستنی شتێک بە شێوەیێکی ماقوولانە ☰ خواهش

**خوایشت** / x(i)wayişt/: ☜ **خوایش**

**خوایشکەر** / x(i)wayişker/: ئاوەلناو. تکاکار؛ خوازمەند؛ خوازیار ☰ خواهشمند

**خوایە** / x(i)waye/: دۆعا. هەقۆ؛ ئەی خودا ☰ خدایا

**خوایی**[۱] / x(i)wayî/: ئاوەلناو. ۱. خودایی؛ پێوەندیدار یان سەر بە خودا ۲. لە خوا ترس ☰ ۱. خدایی ۲. از خدا ترس

ـ **خوایی**[۲]: پاشەوشە. ویست؛ خواست؛ خوازی ‹ئاشتی‌خوایی› ☰ ـ خواهی

**خوایی‌ناخوایی** / x(i)wayînax(i)wayî/: ☜ **خوایی‌نەخوایی**

**خوایی‌نەخوایی** / x(i)wayînex(i)wayî/: ئاوەلکار. خواییناخوایی؛ چاری‌ناچار؛ بتەوێ‌نەتەوێ ☰ خواه‌ناخواهی

**خوباب** / xubab/: ناو. بەرخەبەبە؛ غەبغەب؛ غەوغەوە؛ پێستی شۆڕی بەرمل ☰ غبغب

**خوبار** / xubar/: ناو. خەفتان؛ زەوینی دێم کە بە وشکی بەر لە باران چێندرابێ ☰ زمینی کە قبل از باران بذرافشانی شده باشد

**خوبزە** / xubze/: ناو. نۆکەر؛ خزمەتچی ☰ خدمتکار

**خوپان** / xupan/: ناو. کەلاوە؛ کاولە ☰ ویرانه

**خوت** / xut/: لێل. ← **خوت‌وخالی/ خوت‌وخافڵ/ خوت‌وخۆڕایی**

**خوتا** / xuta/: ☜ **خودا**

**خوترە** / xutre/: ☜ **بەرچیت ـ۱**

**خوترەک** / xutrek/: ناو. ۱. ☜ **بەرچیت ـ۱** ۲. کوتکی لە دار ☰ ۱. ☜ **بەرچیت ـ۱** ۲. پُتک چوبین

**خوتن** / xutin/: ئاوەلناو. ۱. بە بۆلەبۆل؛ پرتەکەر ۲. ڕژد؛ چکووس ☰ ۱. غُرغُرو ۲. خسیس

**خوت‌وخافڵ** / xut û xafił/: ئاوەلکار. ناخافل؛ ناخلاف؛ لەپڕ و نەکاو ☰ ناگهان

**خوت‌وخالی** / xut û xałî/: ئاوەلناو. چۆل‌وهۆل؛ هیچی تێدا ☰ خالی

**خوتوخۆڕایی** / xut û xořayî/: ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. بێ هۆ؛ لە هیچ ≡ بی دلیل

**خوتوکە** / xutûke/: ☜ **ختیلکە**

**خوتە** / xute/: ناو. بۆڵە؛ پرتە ≡ غرولند

▣ **خوتە کردن:** بۆڵە کردن؛ پرتاندن ≡ غرولند کردن

**خوتەخوت** / xutexut/: ناو. بۆڵەبۆڵ؛ پرتەپرت ≡ غرولند

**خوتەک** / xutek/: ناو. ١. ☜ **بەرچیت ـ١** ٢. خوتەرەک؛ کوتکی دارین ≡ ١. ☜ **بەرچیت‌ـ١** ٢. پُتک چوبین

**خوتەن** / xuten/: ناو. بنەما؛ بنەڕەت ‹یە دووس م نییە، دووس م جیاس/ دووسم چەوەیلی لە خوتەن رەژیاس «فولکلۆر»› ≡ بُنیاد

**خوتەوبۆڵە** / xute w bołe/: ناو. پرتەوبۆڵە؛ بۆڵەبۆڵ ≡ غرولند

**خوچ** / xuç/: ناو. *[فەرمەنگی خەڵکی]* خوشک؛ خوەیشک ≡ خواهر

**خوچک** / xuçk/: ☜ **خوشك**

**خوچۆک** / xuçok/: ئاوەڵناو. زۆر چکۆلە؛ وردیلە ≡ ریز

**خوخوتی** / xuxutî/: ئاوەڵناو. خوخویی؛ تایبەتی ≡ ویژە

**خوخویی** / xuxuyî/: ☜ **خوخوتی**

**خوخو** / xuxû/: ناو. پەپوولەپایزە ≡ قاصدک

**خود** / xud/: ☜ **خۆ[1]ـ١**

**خودا** / xuda/: ناو. خوا؛ خوای؛ خوتا؛ خولا؛ بیناهیا چاڤان: ١. خودا؛ خودێ؛ بینایی‌چاوان؛ داهێنەر و ڕاهێنەری جەهان ٢. *[ئیسلام]* هەق؛ کردگار؛ هەبووی تاکانە و بێ‌شەریکی هەتاهەتایی و کۆن، کە جەستەی نییە، نەزاوە و ئافرێنەری جیهانە ٣. *[کۆن]* خودان؛ خاوەند؛ خێوەند؛ خێو؛ وەدیهێنەر و کارگێڕی یەک یان چەند ماکی سروشتی ‹خودای ئاور› ≡ ١تا٣. خدا

▣ **خودا ویستن:** خوا پێ خۆش بوون؛ ویست و خواستی خوا لە سەر بوون ≡ خدا خواستن

**خودا ویستن و خورماش ویستن:** دووسەرە تەمادار بوون؛ داوای هەر دوو لا کردن ≡ هم خدا و هم خرما را خواستن

**خوداپەرس** / xudaperis/: ☜ **خواپەرست**

**خوداپەرست** / xudaperist/: ☜ **خواپەرست**

**خوداحافیز** / xudaĥafîz/: ☜ **خواحافیز**

**خوداخواز** / xudax(i)waz/: ☜ **خواخوا[2]**

**خوداخودا** / xudaxuda/: ناو. خواخوا ↓

▣ **خوداخودا بون:** خواخوا بوون؛ لە خوا خواستن ‹من خوداخودامە نەچیتەوە› ≡ خداخدا کردن

**خوداری** / xudarî/: ☜ **خێداری**

**خوداگیر** / xudagîr/: ئاوەڵناو. خواگیر: ١. زاڵم؛ دەست‌درێژکەر بۆ مافی بێ‌دەسەلات ٢. غەزەب لێ‌باریو ≡ ١. چپاولگر ٢. مورد خشم الهی

**خوداگیری** / xudagîrî/: ناو. کاری ناڕەوا ≡ بی‌انصافی

**خودان** / xudan/: ناو. ١. خێو؛ خاوەن؛ ساحێب ٢. خودا؛ خوا ≡ ١. صاحب ٢. خدا

**خودانهزر** / xudanhizr/: ئاوەڵناو. بیرەوەر؛ بە بیر و هۆش ≡ مُتفکر؛ صاحب فکر

**خوداوراستان** / xudawřastan/: ئاوەڵکار. خواوڕاسان؛ بە ڕێکەوت (بۆ ڕووداوی باش) ≡ حُسن اتفاق

**خوداوەند** / xudawend/: ☜ **خواوەن**

**خودایەتی** / xudayetî/: ☜ **خودێتی**

**خودایی** / xudayî/: ئاوەڵناو. خوایی؛ پێوەندیدار بە خواوە ‹وەرە ماچم دەیە ماچی خودایی!/ کە بێزارم لە ماچی سینەمایی «هێمن»› ≡ خدایی

**خودبینی** / xudbînî/: ناو. خۆبینی؛ خۆپەسنی ≡ خودبینی

**خودپەسن / xudpesin/**: ئاوەڵناو. خودپەسەند؛ خۆپەسند؛ خۆ خۆشەویست ☗ خودپسند

**خودپەسند / xudpesind/**: ☜ **خودپەسن**

**خودتەراش / xudteraş/**: ☜ **خۆتاش**

**خوددار / xuddar/**: ئاوەڵناو. خۆڕاگر؛ پشوودرێژ؛ بە حەوسەڵە ☗ خوددار

**خودداری / xuddarî/**: ناو. خودگیری؛ خۆداری؛ کار و ڕەتی ڕاگرتنی خۆ ☗ خودداری

**خودری / xudrî/**: ئاوەڵناو. خۆڕسک ☗ خودرو

**خودسەر / xudser/**: ☜ **خۆسەر**

**خودسەری / xudserî/**: ☜ **خۆسەری**

**خودکار / xudkar/**: ناو. قەلەمئووچ؛ جۆرێ بنووس بە جەوهەری چەورەوە ☗ خودکار

**خودگیری / xudgîrî/**: ☜ **خودداری**

**خودموختاری / xudmuxtarî/**: ناو. سەربەخۆیی؛ چۆنیەتی بەڕێوە بردنی کار و باری ناوخۆ و دابینکردنی ئاتاجگەلی خۆ، بە دەستی خۆ و بێ دەستێوەردانی نامۆیان ☗ خودمختاری

**خودۆک / xudok/**: ناو. قوونێر؛ جۆرێ دمەڵ ☗ نوعی دُمل

**خودێ / xudê/**: ناو. ١. خودا؛ خوا؛ خوای ٢. خاوەن؛ خێو؛ ساحێو ☗ ١. خدا ٢. صاحب

**خودێتی / xudêtî/**: ناو. خودایەتی ☗ خدایی

**خوران / xuran/**: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //خورای؛ دەخورێی؛ بخورێ// ١. خوریان؛ خورین؛ بە خارشت بوون؛ وە خروو هاتن ٢. خوریان؛ بە خواردن چوون ‹بەیانیان سەموونێکی ڕەقهەلاتووی لە کەلکی خوران کەوتوو، بە چایەکەوە جیرەمان بوو «هەژار، چێشتی مجێور»› ٣. خورانەوە؛ خوریانەوە؛ کرانی کەندال بە هۆی ئاوی ڕووبارەوە ٤. داخوران؛ دارزان؛ هەر لە بەرێکەوە لێ کرانەوە و تێدا چوون ‹نەقدی عومرم بە غەزەل دا و دووکانم دانا/ هیچ کەسێ نەیکڕی، ترسام لە ڕزین و لە خوران «حاجی قادر»› ٥. *[پلار]* گەرەک بوون؛ دڵ پێوە بوون ‹ئەتخورێ بۆ شەڕ؟› ☗ ١. خاریدن ٢تا٤. خورده شدن ٥. میل شدید داشتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: خوراو/ چاوگی نەرێنی: نەخوران

**خوراندن / xurandin/**: چاوگ. //خوراندت؛ دەخورێنی؛ بخورێنە// خوران؛ خارشت لە لەش کردنەوە ☗ خاراندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەخوراندن

**خورانن / xuranin/**: ☜ **خوراندن**

**خورانەوە / xuranewe/**: چاوگ. ١. چووزانەوە؛ سووزانەوەی پێست ٢. چووزانەوە؛ ژان کردنی برین ٣. وەخواردن؛ خوریانەوە ٤. کرمێ بوونی ددان ‹سێ ددانم خوراوەتەوە› ٥. ☜ **داخوران** ٦. کرمۆڵ بوونی ددان ☗ ١. خاریدن پوست ٢. دچار سوزش شدن زخم ٣. نوشیده شدن ۴. فاسد شدن دندان ۵. ☜ **داخوران** ۶. کرمو شدن دندان

**خوراو**[1] **/ xuraw/**: ئاوەڵناو. خوریاگ: ١. بە چنگ هەڵکرێنراو لە بەر خروو ٢. خواردراو ٣. وە بەر ئازار کەوتوو ☗ ١. خاریده شده ٢. خورده شده ٣. آسیب‌دیده

▪ **خوراو**[2]: پاشەوشە. ـ خوریاگ؛ بە زۆر لێ سەنراو ‹ماڵخوراو؛ بەشخوراو› ☗ خورده شده

**خورایلک / xurayilk/**: ناو. شیرهەڵەز؛ شیرمار؛ خوشیلک ☗ شیرگیاه

**خورپ / xurp/**: ناو. خرپ؛ خەوی قورس ☗ خواب سنگین

**خورپان / xurpan/**: چاوگ. خورپیان؛ ڕاتڵەکانی دڵ ‹دڵی هەزاران دایکیان هێنایە خورپان› ☗ دل ریختن

**خورپنایرە / xurpnayre/**: چاوگ. داخورپان ☗ یکّه خوردن

**خورپە / xurpe/**: ناو. تەپەی قەلب ‹خورپە لە

دلمەوە هات› 🇮🇷 تپش قلب

⊡ **خورپە بە دڵدا هێنان:** ☜ **خورپە خستنە دڵ**

**خورپە خستنە دڵ:** خورپە بە دڵدا هێنان؛ تووشی دڵەڕاوکێ کردن ‹دەنگی ئەو پیاوە زۆرم بە گوێ ئاشنا هات، خورپەی خستە دلمەوە› 🇮🇷 مُضطرب کردن

**خورپە کردن:** خورپان؛ لێدان ‹دڵم خورپە ئەکات بۆ دیتنت› 🇮🇷 تپیدن

**خورپە لە دڵەوە هێنان:** تووشی ترس و دڵەڕاوکێ کردن ‹خورپەیان لە دڵی دوژمنانی داگیرکەر هێنا› 🇮🇷 مُضطرب کردن و ترساندن

**خورپەجندۆکە / xurpecindoke/:** ناو. خورپەجنە؛ قۆزەقڕواق؛ کەفز؛ قۆزە 🇮🇷 خزە؛ جلوزغ

**خورپەجنە / xurpec(i)ne/:** ☜ **خورپەجندۆکە**

**خورپیان / xurp(i)yan/:** ☜ **خورپان**

**خورپیای / xurp(i)yay/:** چاوگ. خورپیان 🇮🇷 دل ریختن

**خورپیایەرە / xurp(i)yayere/:** چاوگ. داخورپان 🇮🇷 یکّە خوردن

**خورت**[1] **/ xurt/:** ناو. کوڕ ‹کچ و خورتێ مەی دلۆڤان/ ئیرۆ بکەن جەنگێ گران «جگەرخوێن»› 🇮🇷 پسر

**خورت**[2]**:** ئاوەڵناو. ١. بەهێز؛ زۆردار؛ بەقەوەت ٢. *[مەجاز]* جوامێر؛ ڕەند؛ لاوچاک ٣. *[مەجاز]* تازەلاو ‹گش خورت و جوان و پیر و لاوێ/ با بێن لەگەلم بچینە ڕاوێ «هەژار، مەم‌وزین»› 🇮🇷 ١. نیرومند ٢. جوانمرد ٣. نوجوان

**خورتووم / xurtûm/:** ناو. قرتم؛ قۆرتم 🇮🇷 خرطوم

**خورتی / xurtî/:** ئاوەڵناو. زۆری؛ بە زەبری زۆر 🇮🇷 زورکی

**خورج / xurc/:** ☜ **خورجێن**

**خورجەزین / xurcezîn/:** ناو. هەگبەزین؛ توورەکەی دوولایی کە لە پاش زینەوە هەڵدەواسرێ 🇮🇷 خُرج زین کە بر فتراک بندند

**خورجێن / xurcên/:** ناو. خورج؛ خۆرج؛ هەگبەی لە بەن 🇮🇷 خُرجین

**خورد**[1] **/ xurd/:** ناو. خۆراک؛ خواردەمەنی 🇮🇷 خوراک

**خورد**[2]**:** ئاوەڵناو. ورد؛ هوور 🇮🇷 ریز

**خورد و ورد / xurd û wird/:** ئاوەڵناو. خاوەن سەرنج؛ وریا 🇮🇷 دقیق؛ ریزسنج

**خوردە**[1] **/ xurde/:** ناو. ١. وردە؛ پوولی ورد؛ پارەی هوور ٢. تەوس؛ ڕخنە ‹بێ‌حیلە و خوردە و تەمامن/ مەقبوولێ موعامەلا عەوامن «خانی»› 🇮🇷 ١. پول خرد ٢. ایراد

**خوردە**[2]**:** ئاوەڵناو. ١. چەشتە؛ فێرە خواردن ٢. کەم؛ چکۆلە 🇮🇷 ١. چشتەخوار ٢. اندک

⊡ **خوردە بون:** چەشت بوون؛ دەمەچێشتە بوون 🇮🇷 چشتەخوار شدن

**خوردە کردن:** چەشت کردن؛ دەمەچێشتە کردن 🇮🇷 چشتەخوار کردن

**خوردەفرۆش / xurdef(i)roş/:** ناو. هوردەفرۆش؛ وەردەفرۆش 🇮🇷 خُردەفروش

**خوردەک / xurdek/:** ☜ **جورە ـ٣**

**خوردەگیر / xurdegîr/:** ناو. ڕەخنەگر؛ ئیرادگر 🇮🇷 ایرادگیر

**خورسی / xursî/:** ☜ **خێرۆك**

**خورفاندن / xurfandin/:** چاوگ. خڕاندن؛ خوفراندن؛ بە لاڕێدا بردن؛ بە هەڵەدا بردن ‹خوە دێ کەسی نەخورفینە› 🇮🇷 مُنحرف کردن

**خورفی / xurfî/:** ☜ **خەرفاو**

**خورفین / xurfîn/:** چاوگ. خڕین؛ لاڕێ چوون؛ بە هەڵەدا چوون 🇮🇷 مُنحرف شدن

**خورک / xur(i)k/:** ناو. مۆرد؛ مێرووی خوری‌خۆر 🇮🇷 حشرەی بید

**خورم / xurm/:** ناو. ئالقەیەکی دارینە لە ڕەشماڵ

بەستن و بارکردندا بە کار دێت ≤ حلقەی چوبی نصب چادر و بستن بار

**خورما** / xurma/: ناو. خورمە؛ خوورما؛ خورماوی؛ هورما؛ قەسپ: ۱. دارێکی بەرزی گەرمیانە، بە کۆتەی خڕ و لق و پۆپی وەک چەتر لە سەرەوە، بەرەکەی هۆشەیییە و لە هەوداکەی تەناف دەهۆننەوە ۲. میوەی ئەو دارە کە شیرین و گۆشتن و ناوکدارە ≤ ۱و۲. خُرما

**خورما پێچان** / xurmapêçan/: ناو. مشکی خورما ≤ موش‌خرما

**خورمالو** / xurmalû/: ناو. خورماڵ: ۱. چەن جۆر داری خەزەڵوەری ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی دوورە ۲. بەری گوشتن و ئاوداری ئەو دارانە کە لە تەماتە دەکا، ڕەنگی نارنجییە و بە نەگەیوی تفتە ≤ ۱و۲. خُرمالو

**خورماڵ** / xurmał/: ☜ **خورمالو**

**خورماوی** / xurmawî/: ☜ **خورما**

**خورمایی**[1] / xurmayî/: ناو. ڕەنگی زەردی تۆخ مەیلەو قاوەیی کاڵ ≤ رنگ خُرمایی

**خورمایی**[2]: ئاوەڵناو. بە ڕەنگی زەردی تۆخ مەیلەو قاوەیی کاڵ ≤ خرمایی رنگ

**خورماییلە** / xurmayîle/: ناو. گیایەکە بەرەکەی دەخۆن ≤ گیاهی با ثمر خوراکی

**خورمژ** / xurmij/: ↓

⊡ **خورمژ گەرەک بون**: بە داخوازیگەلی یەک‌نەگر و ناتەباوە بوون ≤ خدا و خرما را با هم خواستن

**خورمە** / xurme/: ☜ **خورما**

**خورمەچیچان** / xurmeçîçan/: ناو. گوڵەمێلاقە؛ ڕەبەنۆک ≤ آلاله

**خورمیان** / xurm(i)yan/: ☜ **خورمیانەوە**

**خورمیانەوە** / xurm(i)yanewe/: چاوگ. خورمیان؛ داڕزان؛ ڕزیان و لە بەر یەک چوون ≤ پوسیدن و وارفتن

**خورمین** / xurmîn/: چاوگ. گرماندی هەور ≤ غُرّش کردن رعد

**خوروڤی** / xuruvî/: ناو. هەرزنەگەورەی بە هێشوو ≤ گیاه گاورس

**خوروێلکە** / xurwêlke/: ☜ **خروێلکە**

**خوروێلکەدار** / xurwêlkedar/: ناو. هاوڵەڕوو؛ ئاوڵاوی ≤ آبله‌گون

**خورۆسەک** / xurosek/: ☜ **خرزەك**

**خورۆش** / xuroş/: ☜ **خرۆش**

**خورۆشان** / xuroşan/: ☜ **خرۆشان**

**خورۆشاندن** / xuroşandin/: ☜ **خرۆشاندن**

**خورۆشاو** / xuroşaw/: ☜ **خرۆشاو**

**خورۆشنای** / xuroşnay/: چاوگ. خرۆشاندن ≤ خروشاندن

**خورۆشیای** / xuroşyay/: چاوگ. خرۆشان ≤ خروشیدن

**خورۆک** / xurok/: ناو. ۱. کرتێن ۲. مرمەند؛ بربەند ≤ ۱. جونده ۲. سوهان

**خورۆمە** / xurome/: ناو. بژارە؛ تاوان؛ سەوس ≤ تاوان

**خورو** / xurû/: ناو. خارشت؛ ئاڵۆش ≤ خارش

⊡ **وە خورو کەوتن**: هاتنە خوران ≤ خاریدن

**خوروزەک** / xurûzek/: ☜ **خرزەك**

**خوروژن** / xurûjin/: ناو. خورووی گش لەش ≤ خارش تمام بدن

**خورووڤی** / xurûvî/: ناو. گارس؛ کارس؛ گلگل ≤ گاورس

**خورووکە** / xurûke/: ☜ **خروێلکە**

**خوری** / xurî/: ناو. ۱. هری؛ هەری؛ پەشم؛ پەژم؛ کولکەی پەز ‹چارەی خوری، ڕستنە «مەسەل»› ۲. ☜ **خروێلکە** ۳. خرووو؛ خارشت ≤ ۱. پشم ۲. ☜ **خروێلکە** ۳. خارش

**خوریا** / xurya/: ناو. دەنگی ناسک و بێ‌خەوشی

مەل ▤ صدای زُلال پرنده

**خوریاگ** / xuryag/: ☜ **خوراو**

**خوریان** / xuryan/: ☜ **خوران**

**خوریانەوە** / xuryanewe/: ☜ **داخوران**

**خوریت** / xurît/: ناو. قەلسی و تووڕەیی ▤ عصبانیت

**خوریخاو** / xurîxaw/: ناو. خوریوخاو؛ مرۆچانە؛ مرۆچلێ؛ مرۆژانە ▤ مورمور تن

**خوریک** / xurîk/: ☜ **خرویلکە**

**خوریکە** / xurîke/: ☜ **خرویلکە**

**خوریلە** / xurîle/: ناو. ۱. ☜ **خرویلکە** ۲. خوری کەم ‹خوریلەی خۆم خۆش بێ!› ▤ ۱. ☜ **خرویلکە** ۲. تکەای پشم

**خورین** / xurîn/: ☜ **خوران**

**خوریوخاو** / xurî w xaw/: ☜ **خوریخاو**

**خوریەجنە** / xur(i)yec(i)ne/: ناو. قەوزە؛ جلشین؛ کەژاو ▤ جلبک

**خوریل** / xurêl/: ناو. نووسەکە؛ نووسەنەک؛ پرمێشک ▤ خاری کە بر لباس می‌چسبد

**خورێن**[۱] / xurên/: ناو. بەرچایی؛ بەرقلیان؛ تاشت ‹بوولێلە کە هات، مەپرسە کەنگێی سالە/ مەی فڕ بکە لە خورێنی بە تاس، بە پیالە «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ▤ صُبحانە

**خورێن**[۲]: ئاوەلناو. ۱. خرێن؛ خورێنی؛ ناشتا؛ هێشتا هیچ‌نەخواردوو پاش لە خەو هەستان ۲. *[کنایە]* برسی؛ هیچ‌نەخواردوو ‹خۆیان هیچیان نەدەخوارد و دەیاندا بەو میوانە ڕەش و ڕووت و برسی و خورێنانە «هێمن»› ۳. لە سەر ئیشتیا؛ برسی (بۆ سەرجێیی) ▤ ۱. ناشتا ۲. گرسنه ۳. حَشَری

◙ **لە خورێنی**: بە دڵی ناشتا؛ بە سکی بەتاڵ ‹بەیانیان لە خورێنی ماست و سیر بخۆن› ▤ ناشتا

• **خورێن**[۳]: پاشەوشە. هێنانە خوراندن ‹سەرخورێن› ▤ ـ خار

**خورێندراو** / xurênd(i)raw/: ئاوەلناو. هەڵکڕاو؛ خوراو ▤ خارانده

**خورێنی** / xurênî/: ☜ **خورێن**[۲]ـ۱

**خوڕ**[۱] / xuř/: ئاوەلناو. ڕەوان؛ وەگەڕ ‹چەمێکی خوڕ لە کوێستانێکی پاکا/ تکەی جارـ جاری پیسی، پیسی ناکا «کاکە ئەحمەد»› ▤ جاری

**خوڕ**[۲]: پێرۆ. ← **خوێن‌وخوڕ**

**خوڕاو** / xuřaw/: ناو. ئاوی بەگوڕ؛ بەتەوژم ▤ تُنداب

**خوڕایەرە** / xuřayere/: چاوگ. داخوڕین ▤ نهیب زدن

**خوڕخوڕ** / xuřxuř/: دەنگەناو. کرخە؛ پرخە؛ پرخەپرخ؛ خرپوق ▤ خروپف

**خوڕ ـ خوڕ**[۱] / xuř xuř/: ئاوەلکار. بەخوڕ؛ لە سەر یەک و بە توندی ‹خوڕ ـ خوڕ فرمێسکی لە چاو دێتە خوار/ پێچ ئەدا لە خۆی وەک ماری زامار «قانع»› ▤ شُرـ شُر

**خوڕ ـ خوڕ**[۲]: دەنگەناو. دەنگی ئاوی زۆر ▤ شُرـ شُر آب

**خوڕڕە** / xuřře/: دەنگەناو. ۱. دەنگی هەڕەشەئاسای کەوان کە بەرانبەر بە یەک دەبن ۲. خوڕە؛ دەنگی ڕۆیشتنی ئاو ▤ ۱. صدای تهدیدآمیز کبک‌ها در مقابل هم ۲. صدای جریان آب

**خوڕڕەم** / xuřřem/: ناو. خوڕەم: ۱. توندی و بەتەوژمی با ۲. بارشی توندی باران ▤ ۱. شدّت فشار باد ۲. رگبار باران

◙ **خوڕڕەم کردن**: توند و بەتەوژمەوە بارین ▤ بە شدت باریدن

**خوڕزم** / xuřzim/: ناو. تەوژمی ڕێژنە؛ تاوی توندی باران ▤ رگبار

**خوڕگە** / xuřge/: ناو. ۱. نێرینەی ئاو ۲. دەراوی تەنگ بۆ چەم ‹لە خوڕگە مەلەی دەکرد› ▤ ۱.

وسط موج آب ٢. مجرای تنگ رودخانه

**خوڕه** / xuře/: دەنگـەناو. دەنگـی ڕۆیشـتنی ئـاو ‹قاسپەی کەوانی قەد کێوەکانت/ خوڕەی ئاوانی نشێوەکانت «یونس دلدار»› 📖 صدای جریان آب

**خوڕەم**[١] / xuřem/: ☜ **خووڕەم**

**خوڕەم**[٢]: ئاوەلناو. خوڕ؛ زۆر لەگەڕ ‹وەک شەپۆلی زێی خوڕەم ساتێ هەدا دانم نییە/ گێژ دەخۆم، پێچێ دەدەم، من ڕۆلەکوردی ئەم سەدەم «هێمن»› 📖 تُند (جریان آب)

**خوڕی** / xuřî/: ناو. پێت؛ گڕەگڕی ئاگر 📖 گُرگُر آتش

**خوڕین** / xuřîn/: چاوگ. ١. گەف کردن؛ هەڕەشە کردن ٢. پڕماندنی ئەسپ لە مەیدانی شەڕدا 📖 ١. نهیب زدن ٢. شیهه کشیدن اسب در میدان جنگ

⊡ **بە شتێک خوڕین**: پـێ خـوڕین؛ پێـوە نـازین؛ شانازی کردن بە شتێکەوە ‹بە ماڵ و سامانی دەخوڕێ› 📖 فخر فروختن

**خوڕیەیرە** / xuřyeyre/: چاوگ. داخوڕین 📖 نهیب زدن

**خوڕێن** / xuřîn/: ناو. خوڕ؛ نێرینەی چەم کە بە توندی دێت 📖 قسمت پرفشار آب رودخانه

**خوز**[١] / xuz/: ناو. ١. چرچ و لۆچ ٢. چـین؛ لا لـە سـەر لا ٣. خزگەماسـی؛ شـوێنی قوڵاغـە دانی ماسی ٤. خوزی؛ تف؛ لیکاو 📖 ١. چین و چروک ٢. چین و شکن ٣. پناهگاه ماهیان ٤. لعاب دهان

**خوز**[٢]: ئاوەلناو. کووڕ؛ پشتچەماو 📖 کوژپشت

**خوزار** / xuzar/: ناو. میوە؛ مێوە؛ فێقی؛ فێکی 📖 میوه

**خوزچەک** / xuzçek/: ئاوەلناو. [ناشیرین] خوزەچەک؛ خوزگ؛ کوونی؛ قووندەر 📖 کونی

**خوزرە** / xuzre/: ناو. زیندووڵە؛ میکرۆب 📖 میکرُب

**خوزگ** / xuzig/: ☜ **خوزچەك**

**خوزگە**[١] / xuzge/: ناو. خوشیل؛ خوزە؛ خزگەی ماسی 📖 پناهگاه ماهیان

**خوزگە**[٢]: ☜ **خۆزگە**

**خوزە** / xuze/: ناو. ١. خزگەماسی ٢. ☜ **خوسار** 📖 ١. پناهگاه ماهیان ٢. ☜ **خوسار**

⊡ **خوزە دان**: بە پێدزکە دەرباز بوون 📖 جیم شدن

**خوزە کردن**: خۆ مات دانی کەروێشک لە نێو بەفردا 📖 پنهان شدن خرگوش میان برف

**خوزەچەک** / xuzeçek/: ☜ **خوزچەك**

**خوزەو** / xuzew/: ☜ **خۆزگە**

**خوزی** / xuzî/: ناو. خوز؛ تف؛ لیکاو 📖 لعاب دهن

**خوزیلێک** / xuzîlêk/: ناو. [شوورەیی] قوز؛ خەمشە؛ شەرمی ژن 📖 آلت تناسلی زن

**خوژە** / xuje/: ناو. خوژێ؛ ئەسرێلک؛ گیاچرێش 📖 گیاه سریش

**خوژیلک** / xujîlik/: ☜ **خوشیلك**

**خوژین** / xujîn/: دەنگـەناو. هەنکەهـەنک؛ دەنگـی هەناسەدانی ماندوو 📖 هِن‌وهِن

**خوژێ** / xujê/: ☜ **خوژە**

**خوس**[١] / xus/: ناو. گوشار؛ زۆر 📖 فشار

⊡ **خوس دان**: ١. گوشـار دان ٢. [کینایە] زۆر بـۆ هێنان 📖 ١. فشار دادن ٢. تحت فشار قرار دان

**خوس**[٢]: دەنگ. وسـت؛ وس؛ بێـدەنگ بـە؛ وشـەی فەرمان 📖 هیس

**خوسار** / xusar/: ☜ **خوسار**

**خوسپ** / xusp/: ناو. پاشملە؛ غەیبەت 📖 غیبت

**خوسپە** / xuspe/: ناو. خەم؛ خەفەت 📖 اندوه

**خوست** / xust/: ناو. ١. خوسـتە؛ جووڵـە؛ بـزاو ٢. داوێن 📖 ١. کمترین حرکت ٢. دامن

⊡ **خوست بڕین**: لـە جووڵـە خسـتن؛ تکـان بـڕین ‹لافی دەمی تۆ غونچە لە دەمیا بوو، بە عەمـدا/ بـا خوسـتی بـڕی خسـتی، کـە مسـتێکی لـە دەم دا «نالی»› 📖 از حرکت انداختن

**خوستە** / xuste/: ☜ **خوست ـ١**

**خوسرین / xusrîn/**: چاوگ. دۆڕان؛ زیان دیتن ‹حەموو پارەیێن خوە د قومارێ دەخوسری› 🇮🇷 باختن

**خوسن / xus(i)n/**: ناو. خوسەند؛ خوەسن؛ خۆسن؛ خەسن؛ جوێن؛ جنێو؛ دژمان؛ دژوێن؛ سخێف 🇮🇷 دُشنام

**خوسەند / xusend/**: ☜ **خوسن**

**خوش / xuş/**: دەنگەناو. ١. دەنگی تیژی تراوی کەم ٢. دەنگی شیر لە دۆشیندا 🇮🇷 ١. شُر ـــ شُر ٢. صدای دوشیدن شیر

◘ **خوش دادان**: بە جوانی دۆشرانی شیری مانگا ‹ئەو مانگایە هەتا گوێلکەکەی نەلێسیتەوە، خوش دانادا› 🇮🇷 بە خوبی دوشیده شدن گاو

**خوشار / xuşar/**: ناو. تەوژم؛ کار و ڕەوتی گوشین 🇮🇷 فشار

**خوشاردن / xuşardin/**: چاوگ. گوشار دان 🇮🇷 فشُردن

**خوشان / xuşan/**: ☜ **خوشین**

**خوش ـ خوش / xuş xuş/**: دەنگەناو. دەنگی دۆشینی شیر بە شوێن یەکا 🇮🇷 صدای دوشیدن شیر

**خوشخوشک / xuşxuşk/**: ناو. ١. لوو؛ گرێ گۆشت ٢. خوشخوشکە؛ سپڵ 🇮🇷 ١. غُدە ٢. طحال؛ سپُرز

**خوشخوشکە / xuşxuşke/**: ☜ **خوشخوشک ـ٢**

**خوشدەر / xuşder/**: ناو. ئافتاوە 🇮🇷 آفتابە

**خوشک / xuşk/**: ناو. خوەیشک؛ خویشک؛ خوێشک؛ خوشیک؛ خوەشیک؛ خۆشک؛ خویە؛ خوەر؛ خوە؛ خوەه؛ خوویشک؛ خوچ؛ خوچک؛ خوار؛ خوانگ؛ خوێ؛ خە؛ خیچ؛ خێنگ؛ دەرە؛ دەدە؛ باجی؛ والێ؛ وا؛ وارە؛ واهەر؛ وایە؛ وایکە؛ وۆیە؛ گیانداری مێینە (بەتایبەت مرۆڤ)ی خاوەن یەک دایک و باوک (یان تەنیا باوک یان دایک) لەگەڵ کەسێکی‌تردا 🇮🇷 خواهر

**خوشکانی / xuşkanî/**: ناو. وشکی؛ هشکی؛ وشکانی 🇮🇷 خشکی

**خوشکایەتی / xuşkayetî/**: ناو. خوشکێتی؛ خوشکێنی: ١. پەیوەندی دوو خوشک پێکەوە ٢. *[مەجاز]* نێوانخۆشی دوو یان چەند ژن پێکەوە 🇮🇷 ١و٢. خواهری

**خوشکۆک / xuşkok/**: ☜ **خوشیك**

**خوشکەزا / xuşkeza/**: ناو. خوارزا؛ خوارزێ؛ خۆیشکەزا؛ خوەیشکەزا؛ خوویشکەزا؛ وارەزا؛ خوەزا؛ منالی خوشک 🇮🇷 خواهرزادە

**خوشکەزازا / xuşkezaza/**: ناو. نەوەی خوشک 🇮🇷 نوەی خواهر

**خوشکێتی / xuşkêtî/**: ☜ **خوشکایەتی**

**خوشکێنی / xuşkênî/**: ☜ **خوشکایەتی**

**خوشۆک / xuşok/**: ☜ **خوشیك**

**خوشە / xuşe/**: دەنگەناو. خوش‌ـخوش؛ دەنگی لە سەر یەکی دۆشینی شیر 🇮🇷 صدای دوشیدن شیر

**خوشیان / xuşyan/**: ☜ **خوشین**

**خوشیک / xuşîk/**: ناوەڵناو. خوشینک؛ خوشۆک؛ خوشکۆک؛ سپەهی؛ جوانکیلە؛ دەلال؛ جوان و دڵگر ‹سوورگوڵ دوو لە پنجی شا ڕوابوو/ دوو خوشکی خوشیک و یەک برا بوون «هەژار، *مەموزین*»› 🇮🇷 زیبا

**خوشیکی / xuşîkî/**: ناو. جوانی؛ قەشەنگی 🇮🇷 زیبایی

**خوشیل / xuşîl/**: ناو. ١. ☜ **خوشیلك** ٢. خزگەی ماسی ٣. ڕنووی هەرەس هێناو؛ کلێلەی پساو 🇮🇷 ١. ☜ **خوشیلك** ٢. پناهگاه ماهیان ٣. بهمن

**خوشیلک / xuşîlik/**: ناو. خوژیلک؛ خوشیلکە؛ خوشیل؛ شیرکتک؛ گیایەکی بەرزەبالای شیردارە، گەڵاکەی لە گەڵای داربی دەکا 🇮🇷 شیرگیاه

**خوشیلکە / xuşîlke/**: ☜ **خوشیلك**

**خوشین / xuşîn/**: چاوگ. خوشان؛ خوشیان: ١.

ڕاکشانی ئەستێرە ٢. ڕێ کردنی خزۆک ‹مارەکە بێرەدا خوشی› ٰ ١. جهیدن شهاب ٢. خزیدن

**خوشینک** / xuşînik/: ☜ **خوشیك**

**خـول**[1] / xul/: نـاو. ١. سـووڕ؛ چـەرخ ٢. گـەڕ؛ گـەردش؛ گـەردین ٣. دەورە؛ قۆنـاخ ‹خولـی فێرکاری› ٰ ١. چرخش ٢. گردش ٣. دوره

▣ **خول خواردن**: زڤرین؛ سووڕ خواردن ٰ چرخیدن

**خول دان**: سووڕ دان ٰ چرخاندن

**خول هەڵبون**: بریتی لـە خـۆ بـادان و بـە پەلـە ڕۆشتن بەرەو کارێ ‹خێرا لەو لاوە خول هەڵبوو بۆ ئەم کارە› ٰ با شتاب رفتن به سوی کاری

**خـول**[2]: ئاوەڵـناو. ١. مـڵخـوار لــە نەخۆشــی ٢. شێتۆکە؛ کەللەیی ٣. گێج؛ وڕ ٰ ١. زرد و ضـعیف از بیماری ٢. خُل ٣. منگ

**خولام** / xulam/: ناو. نۆکەر؛ بەنی ٰ غلام

**خولامەتی** / xulametî/: نـاو. نۆکەری؛ خزمەتکاری ٰ غُلامی

**خولان** / xulan/: چاوگ. خولیان؛ خولیای؛ سووڕان ٰ چرخیدن

**خولاندن** / xulandin/: چاوگ. خولنای؛ خول دان؛ سووڕاندن ٰ چرخاندن

**خولاندنـەوە** / xulandinewe/: چـاوگ. تێـپەڕ. //خولاندتەوە؛ دەخولێنییەوە؛ بخولێنەوە// خولنـایۆ: ١. سـووڕاندن؛ زڤـراندن ٢. *[کینایـە]* سـەر لێشێواندن ٰ ١. چرخاندن ٢. سرگردان کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەخولاندنەوە

**خولانەوە** / xulanewe/: چاوگ. تێنەپەڕ. //خولایەوە؛ دەخولێیـەوە؛ بوخولێـوە// خولیانـەوە؛ خولیـایۆ: ١. سووڕانەوە؛ چەرخانەوە ٢. *[کینایە]* بە خۆڕایی و بێ کاروبار گەڕان ٰ ١. چرخیدن ٢. وِل گشتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەخولانەوە

**خولخاو** / xulxaw/: ناو. خولیوخاو؛ بـزاڤ؛ جووڵـە ٰ تکان

**خول،خول**/ xul xul/: ئاوەڵکار. پاش سووڕانەوەیەکی زۆر ‹زۆر شاران گەڕا و خول ـ خول هاتەوە بـۆ ئێـرە› ٰ پس از گشتن بسیار

**خولخول**/ xulxul/: دەنگەناو. دەنگی ڕۆیشتنی ئـاو؛ خوڕخوڕی ئاو ٰ شُرـ شُر آب

**خولخولۆکە** / xulxuloke/: ناو. ١. ☜ **خولخولە** ٢. مزراحێن؛ ناوی گەمەیەکە بە خولخولە ٰ ١. ☜ **خولخولە** ٢. بازی گردنا

**خولخولـە** / xulxule/: نـاو. خولخولۆکـە؛ خولـوو؛ کەرخول؛ تەرخول؛ چێـوێکی لـە خـەرت دراوی لووس کراوی قووتەکی نووکدارە لە سـەر کلکـەوە دەیسووڕێننەوە ٰ گردنا

**خولخۆر** / xulxor/: ئاوەڵناو. بگەڕ ٰ چرخان

**خولخۆلـە** / xulxole/: نـاو. سـەبیلەی شـەیتان؛ دەسکەگۆزە و دێزەی شکاو کە منال گەمەی پێ دەکەن ٰ دستەی شکستەی سبو

**خـولدراو** / xuld(i)raw/: ئاوەڵـناو. هەڵسـووڕاو ٰ چرخیده

**خولق** / xulq/: ☜ **خولّق ـ١**

**خولقان** / xulqan/: ☜ **خولّقان**

**خولقاندن** / xulqandin/: ☜ **خولّقاندن**

**خولقاو** / xulqaw/: ناو. ڕسکاو؛ ئافەریدە ٰ آفریده

**خولقنای** / xulqnay/: ☜ **خولّقاندن**

**خولقیان** / xulq(i)yan/: ☜ **خولّقان**

**خولقیای** / xulqyay/: ☜ **خولّقان**

**خولکە** / xulke/: ☜ **خولەك**

**خولگـە** / xulge/: نـاو. ١. جـەغز ٢. هێڵـی هەڵسـووڕان ‹خولگـەی زەویـن لـە دەوری خـۆر هێلکەییە› ٰ ١. دایره ٢. مدار

**خولنای** / xulnay/: ☜ **خولاندن**

**خولنایۆ** / xulnayo/: ☜ **خولاندنەوە**

**خولۆر** / xulor/: ئاوەڵناو. خلۆر ٰ غلتان

**خولۆلیک** / xulolîk/: نـاو. وردەتەرزە؛ تەرزەی ورد؛

تەیرۆکی هوور تگرگ ریز

**خولوتە** / xulûte/: ناو. هەر شتێکی گرۆڤەر کە بەنێکی تێوە دەپێچرێ قرقره

**خولەقومارباز** / xulequmarbaz/: ناو. لەیلاج؛ قوماربازی زۆر لێزان لیلاج؛ قُمارباز ماهر

**خولەک** / xulek/: ناو. خولکە: ١. عەقرەبەی سەعات ٢. دیقە؛ دەقیقە ١. عقربەی ساعت ٢. دقیقه

**خولیا** / xulya/: ناو. کەلکەلە؛ هەوەس؛ خەیاڵ و ئارەزوو ‹لەوەتەی خولیات کەوتۆتە سەرم/ هەر نەموێراوە تێر ناوت بەرم «فولکلۆر»› هوا؛ میل و خواسته

**خولیان**[1] / xulyan/: ☜ خولان

**خولیان**[2]: ناو. خەیاڵات؛ ئاواتی پڕ و پووچ آرزوهای بیهوده

**خولیانەوە** / xulyanewe/: ☜ خولانەوە

**خولیای** / xulyay/: ☜ خولان

**خولیایۆ** / xulyayo/: ☜ خولانەوە

**خولیدان** / xulîdan/: ☜ خۆلیدان

**خولیدانک** / xulîdanik/: ☜ خۆلیدان

**خولیسک** / xulîsk/: ☜ خلیسك

**خولیوخاو** / xulîwxaw/: ☜ خولخاو

**خوڵا** / xuła/: ناو. /*ئەرمەنگی خەڵکی*/ خودا؛ خوا خدا

**خوڵاپەڕک** / xułapeřik/: ناو. فریشتە؛ پەری فرشته

**خوڵام** / xułam/: ناو. خولام؛ نۆکەر غُلام

**خوڵامانە** / xułamane/: ناو. غولامانە: ١. کاکۆڵی تەپلەسەری لاوان ٢. پەلکی گوڵی گوڵەبەڕۆژە ١. کاکُل جوانان ٢. گُلبرگ آفتابگردان

**خوڵامەتی** / xułametî/: ناو. نۆکەری؛ خزمەتکاری غُلامی

**خوڵامی** / xułamî/: ناو. نۆکەری نوکری

**خوڵتە** / xułte/: ناو. مەرایی؛ کلکەسووتە؛ ماستاوکەری؛ کلکەفلێ؛ کلکەلەقێ تملُّق؛ چاپلوسی

**خوڵتەکەر** / xułteker/: ناوەڵناو. ئاشماڵ؛ تووتار؛ دەڤحلوی چاپلوس

**خوڵخوڵە** / xułxułe/: ناو. زەنا ـ زەنا؛ هەرا و چەقە همهمه؛ هیاهو

**خوڵق** / xułq/: ناو. ١. خولق؛ خوو؛ ئاکار ٢. ☜ خوڵك ١. خُلق؛ خوی ٢. ☜ خوڵك

**خوڵقان** / xułqan/: چاوگ. تێنەپەر. //خولقای؛ دەخولقێی؛ بخولقێ// خولقان؛ خولقیان؛ دروست بوون آفریده شدن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: خولقاو/ چاوگی نەرێنی: نەخولقان

**خوڵقاندن** / xułqandin/: چاوگ. تێپەر. //خولقاندت؛ دەخولقێنی؛ بخولقێنە// خولقاندن؛ خولقنای؛ چێ کرن؛ ئافراندن آفریدن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەخولقاندن

**خوڵقاو** / xułqaw/: ناوەڵناو. چێبوو؛ دروستکراو آفریده

**خوڵقەت** / xułqet/: ناو. خۆوخدە خُلق

**خوڵقێنەر** / xułqêner/: ناوەڵناو. بەدیهێنەر آفریننده

**خوڵک** / xułk/: ناو. خولق؛ دەعوەت؛ گازی بۆ بەشدار بوون ‹لەرزانەکانت لە یەک ناکەوێ/ بۆ خولکم ناکەی بۆ تەنیا شەوێ؟ «فولکلۆر»› دعوت

**خوڵوپاندن** / xułupandin/: ☜ خوڵۆپاندن

**خوڵوپانن** / xułupanin/: ☜ خوڵۆپاندن

**خوڵۆپ** / xułop/: ناو. گەوز؛ کاری بە ڕاکشاوی ئەمدیو ـ ئەودیو کردن غلت

**خوڵۆپان** / xułopan/: چاوگ. تێنەپەر. //خولۆپای؛ دەخولۆپێی؛ بخولۆپێ// خولەپان؛ خولۆپیان؛ خولۆپیانەوە؛ خولەپیانەوە؛ گەوزین غلتیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: خولۆپاو/ چاوگی نەرێنی: نەخولۆپان

**خولۆپاندن** / xułopandin/: چاوگ. خولۆپانن؛ خولوپاندن؛ خولوپانن؛ گەوزاندن 🇮🇷 غلتاندن

**خولۆپاندنەوە** / xułopandinewe/: چاوگ. تێپەڕ. //خولۆپاندتەوە؛ دەخولۆپێنییەوە؛ بخولۆپێنەوە// خولۆپانن؛ خولەپاندنەوە؛ گەوزاندن 🇮🇷 غلتاندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـــ/ چاوگی نەرێنی: نەخولۆپاندنەوە

**خولۆپانن** / xułopanin/: ☜ **خولۆپاندن**

**خولۆپیان** / xułopyan/: ☜ **خولۆپان**

**خولۆپیانەوە** / xułopyanewe/: ☜ **خولۆپان**

**خوڵو** / xułû/: ناو. ١. خولخولە ٢. خولخولە؛ زەناـ زەنا؛ هەراوهوریا 🇮🇷 ١. گردنا ٢. همهمه

**خولەپان** / xułepan/: ☜ **خولۆپان**

**خولەپاندنەوە** / xułepand(i)newe/: ☜ **خولۆپاندنەوە**

**خولەپیانەوە** / xułepyanewe/: ☜ **خولۆپان**

**خوم** / xum/: ناو. ١. خم؛ هەش ٢. کووپە 🇮🇷 ١. نیل ٢. خُم

⊡ **خوم شێوان**: ☜ **خم شێوان**

**خومار** / xumar/: ئاوەڵناو. خاو؛ خەواڵوو؛ تووشیاری سەرێشەی دوای سەرخۆشی 🇮🇷 خُمار

**خوماری** / xumarî/: ناو. خاوی: ١. خەواڵوویی ٢. دۆخی دابڕان لەوەی خووی پێ گیراوە ٣. سەرئێشەی دوای سەرخۆشی 🇮🇷 ١تا٣. خُماری

**خومارین** / xumarîn/: ناو. کز و خەفەیی ئاگر لە نزیکی کوژانەوەدا 🇮🇷 آتش در حال خاموشی

**خومالیک** / xumalîk/: ناو. کووپە 🇮🇷 خُم

**خومام**[1] / xumam/: ناو. ١. تەم و مژ ٢. لەش‌پۆش لە کاتی ڕازاندا 🇮🇷 ١. مه ٢. روانداز

**خومام**[2]: ئاوەڵناو. تخێل 🇮🇷 دراز کشیده

**خومپارە** / xumpare/: ☜ **قومپارە**

**خومچی** / xumçî/: ناو. خومخانەچی؛ خمگەر؛ ڕەنگرێژ 🇮🇷 رنگرز

**خومخانە** / xumxane/: ناو. خمخانە 🇮🇷 رنگرزی

**خومخانەچی** / xumxaneçî/: ☜ **خومچی**

**خومخۆک** / xumx(i)mok/: ☜ **خمخۆك**

**خومخوم**[1] / xumxum/: ئاوەڵناو. شەنگ و شۆخ 🇮🇷 زیبا و دلربُا

**خومخوم**[2]: دەنگەناو. ١. گرمەی هەور ٢. دەنگی ئاو کە بە ڕووبار و جۆگەدا دەڕوا 🇮🇷 ١. غُرّش ابر ٢. صدای جریان آب در رود و جویبار

**خومخۆرک** / xumxorik/: ناو. قەڵەشتی زەوین 🇮🇷 شکاف زمین

**خومری** / xumrî/: ناو. خورمایی؛ سووری ئاماڵڕەش 🇮🇷 رنگ خرمایی

**خومستان** / xumistan/: ناو. بیابان؛ بیاوان 🇮🇷 بیابان

**خومشێوێن** / xumşêwên/: ☜ **خم‌شێوێن**

**خومگەر** / xumger/: ناو. خمگەر 🇮🇷 رنگرز

**خومگەری** / xumgerî/: ناو. ڕەنگرەزی 🇮🇷 رنگرزی

**خومین** / xummîn/: چاوگ. دەربەدەر بوون؛ ئاوارە بوون 🇮🇷 آواره شدن

**خومەرژە** / xumeř(i)je/: ☜ **کاسەڵەشینکە**

**خومەرشکە** / xumeřişke/: ☜ **کاسەڵەشینکە**

**خومەرەژگە** / xumeřejge/: ☜ **کاسەڵەشینکە**

**خومەرەژە** / xumeřeje/: ☜ **کاسەڵەشینکە**

**خومەرەشکە** / xumeřeşke/: ☜ **کاسەڵەشینکە**

**خومەرێژە** / xumeřêje/: ☜ **کاسەڵەشینکە**

**خومەشوێنکە** / xumeş(i)wênke/: ☜ **خم‌شێوێن**

**خومەشوێنە** / xumeş(i)wêne/: ☜ **خم‌شێوێن**

**خومەشینکە** / xumeşînke/: ☜ **کاسەڵەشینکە**

**خومەشێونە** / xumeşêwne/: ☜ **خم‌شێوێن**

**خومەهەردە** / xumeherde/: ناو. گیاوەسمە؛ گیایەکە خومی لێ چێ دەکەن 🇮🇷 وسمه

**خومی**[1] / xumî/: ناو. خمی 🇮🇷 نیلی

**خومی**[۲]: ئاوەڵناو. بە ڕەنگی خمی ≡ نیلی رنگ

**خومیا / xumya/**: ئاوەڵناو. بە سەر یەکدا کۆمبوو ≡ بر هم انباشته

**خومین / xumîn/**: ئاوەڵناو. بە ڕەنگی خمی ≡ نیلی رنگ

**خوناڤ / xunav/**: ناو. خناف؛ خناو؛ خوناو: ۱. خوناوە؛ شەونم؛ ئاونگ؛ خۆ؛ خۆی ۲. پریشکە بارانی زۆر ورد و لە سەرەخۆ ≡ ۱. شبنم ۲. نم ـ نم باران

**خوناو / xunaw/**: ناو. ۱. ☜ **خوناڤ** ۲. ئاوی شۆربا و قاورمە ≡ ۱. ☜ **خوناڤ** ۲. آبِ آش و قُرمه

**خوناوکە / xunawke/**: ناو. ۱. وردەبارانی هێدی و نەرم ‹خوناوکە باری چیمەن ئاو درا/ چلی گوڵی سوور بوو بە چلچرا «حەقیقی»› ۲. ئاوی لە قووڵکەدا ماوی باران ۳. *[مەجاز]* دەنکە- دەنکەی ئارەقەی دەم و چاو ‹ئەو کەسەی بمژێ خوناوکەی گەردەنێ/ کوفرە یەک قەترە شەرابی، گەر دەنێ «هێمن»› ≡ ۱. نم ـ نم باران ۲. باران جمع شده در گودال ۳. دانه‌های عرق صورت و تن

**خوناوە / xunawe/**: ☜ **خوناڤ ـ۱**

**خونج / xunc/**: ناو. ۱. گونج؛ دۆخ و چۆنیەتی جێ بوونەوە؛ دێران ۲. قوون؛ کۆم ≡ ۱. گنجایش ۲. مقعد

**خونجان / xuncan/**: چاوگ. خونجیان؛ گونجان؛ جێ بوونەوە ≡ گُنجایش داشتن؛ گُنجیدن

**خونجاندن / xuncandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //خونجاندت؛ دەخونجێنی؛ بخونجێنە// خونجانن؛ خونچنای؛ گونجاندن؛ جێ کردنەوە؛ جێگا تێدا کردنەوە ≡ گُنجاندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەخونجاندن

**خونجانن / xuncanin/**: ☜ **خونجاندن**

**خونجگا / xuncga/**: ناو. شوێنی تێدا جێ بوونەوە ≡ گُنجایشگاه

**خونجیان / xunc(i)yan/**: ☜ **خونجان**

**خونجیلانە / xuncîlane/**: ☜ **خنجیلانە**

**خونجیلە / xuncîle/**: ☜ **خنجیلانە**

**خونچنای / xunçnay/**: ☜ **خونجاندن**

**خونچە / xunçe/**: ناو. غونچە؛ گۆچک؛ گۆپکە؛ کوڵووک؛ گوڵووک؛ گولیک؛ کڵووک؛ بیرۆڤ؛ چم؛ چاو؛ چەو؛ چەم؛ چاوڕاو؛ واتوورە؛ جیق؛ جووزەرە؛ جۆش؛ ولی؛ پۆک؛ پێژەک؛ گولباڤ؛ فنچقە؛ سۆلینە؛ قوومچە؛ گوڵدەم؛ چوزە؛ قەیتول؛ پشکوژ؛ چرۆ؛ گوڵی هێشتا نەپشکووتوو ≡ غُنچه

**خونچیای / xunç(i)yay/**: ☜ **خونجان**

**خونچیلانە / xunçîlane/**: ☜ **خنجیلانە**

**خونچیلە / xunçîle/**: ☜ **خنجیلانە**

**خونخوار / xunx(i)war/**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* زاڵم؛ بێبەزە؛ دڵڕەق ≡ خونخوار

**خوندن / xundin/**: ☜ **خوێندن**

**خونقین / xunqîn/**: چاوگ. بارینی نمنمە و کەم ـ کەم ≡ نم ـ نم باریدن

**خونک / xunk/**: ئاوەڵناو. ۱. جلف؛ سووک ۲. چکووس؛ هەنگوتکژمێر ≡ ۱. جلف ۲. خسیس

**خونکار / xunkar/**: ناو. ۱. پاتشای گەورە ۲. میر؛ خاوەن دەسەڵات ≡ ۱. فرمانروای بزرگ ۲. امیر

**خونین / xunîn/**: چاوگ. خونقین؛ بارینی نمنمە و کەم ـ کەم ‹ماوەیەکە نمنمە دەخونێ› ≡ نم ـ نم باریدن

**خووێک / xuwêk/**: ☜ **خەراج**

**خوە / x(i)we/**: ☜ **خۆ**[۲]

**خوەر / x(i)wer/**: ☜ **خۆر**[۱]**ـ۱**

**خوەراوا / x(i)werawa/**: ☜ **خۆراوا**

⊡ **خوەراوا بوون** ☜ **خۆراوا بوون**

**خوەرتاو / x(i)wertaw/**: ☜ **خۆرەتاو**

**خوەرداش / x(i)werdaş/**: ☜ **خۆراکی**

**خـــوەردۆس** / x(i)werdos/: نـــاو. لالــــەباس؛ لالەعەباسی 🇮🇷 لالەعباسی

**خوەرشت** / x(i)werişt/: ☜ خۆرشت

**خوەرگیر** / x(i)wergîr/: ئاوەڵناو. بـەڕۆژ؛ ڕووەو ڕۆژ 🇮🇷 آفتابگیر

**خوەرە** / x(i)were/: ☜ خۆرە[1]

**خوەرەتاو** / x(i)weretaw/: ☜ خۆرەتاو

**خوەرەزەرد** / x(i)werezerd/: ناو. دەمی خـۆر ئـاوا بوون 🇮🇷 غروبگان

**خوەزگ** / x(i)wezig/: ☜ خۆزگە

**خوەزگە** / x(i)wezge/: ☜ خۆزگە

**خوەزوو** / x(i)wezû/: ☜ خۆزگە

**خوەزوور** / x(i)wezûr/: ☜ خەزوور

**خوەزی** / x(i)wezî/: ☜ خۆزگە

**خوەزیا** / x(i)wezya/: ☜ خۆزگە

**خوەزێو** / x(i)wezêw/: ☜ خۆزگە

**خوەسن** / x(i)wesin/: ☜ خوسن

**خوەش** / x(i)weş/: ☜ خۆش

**خوەشاو** / x(i)weşaw/: ☜ خۆشاو

**خوەشخوا** / x(i)weşx(i)wa/: ☜ خۆشخوێ

**خوەشخوێ** / x(i)weşx(i)wê/: ☜ خۆشخوێ

**خوەشقسە** / x(i)weşq(i)se/: ئاوەڵناو. قسـەخۆش؛ دەموڕاوێژخۆش 🇮🇷 شیرینسُخن

• **خوەشە** / -x(i)weşe/: پاشەوشـە. خۆشکە؛ نـە تـاڵ ‹پێشەخوەشە› 🇮🇷 شیرین

**خوەشەویس** / x(i)weşewîs/: ☜ خۆشەویست

**خوەشەویسی** / x(i)weşewîsî/: ☜ خۆشەویستی

**خوەشی** / x(i)weşî/: ☜ خۆشی

**خوەشیک** / x(i)weşîk/: ☜ خوشك

**خوەڵ** / x(i)weł/: ☜ خۆڵ[1]

**خوەڵەشێرە** / x(i)wełeşêre/: ☜ خۆڵوشیر

**خوەڵەکەوان** / x(i)wełekewan/: ☜ خۆڵەکەوان

**خوەڵەکەووو** / x(i)wełekewû/: ☜ خۆڵەکەوە

**خوەمانی** / x(i)wemanî/: ☜ خۆمانە

**خوەن** / x(i)wen/: ☜ خوێن[1]

**خوەنن** / x(i)wenin/: ☜ خوێندن

**خوەنەوار** / x(i)wenewar/: ☜ خوێندەوار

**خوەنەواری** / x(i)wenewarî/: ☜ خوێندەواری

**خوەنین** / x(i)wenîn/: چاوگ. حاشـا کـردن؛ دان پێدا نەنان 🇮🇷 انکار کردن

**خوەه** / x(i)weh/: ☜ خوشك

**خوەی**[1] / x(i)wey/: چاوگ. پێکەنین 🇮🇷 خندیدن

**خوەی**[2]: ☜ خوێ ـ١

**خوەیشک** / x(i)weşk/: ☜ خوشك

**خوەیشکەزا** / x(i)weyşkeza/: ☜ خوشکەزا

**خوهزا** / xuhza/: ☜ خوشکەزا

**خویـا** / xuya/: ئاوەڵـناو. خویـان؛ دیـار؛ ئاشـکرا؛ بەرچاو 🇮🇷 آشکار؛ پیدا

**خویان** / xuyan/: ☜ خویا

**خویانەک** / xuyanek/: ناو. دیمەن؛ بەرجـەوەن 🇮🇷 چشم‌انداز

**خویایە** / xuyaye/: ئـامراز. تمەز؛ تومەز؛ تمەس 🇮🇷 تو نگو

**خویـایی** / xuyayî/: نـاو. ئاشـکرایی؛ دیـاردە 🇮🇷 آشکاری

**خویز** / x(i)wîz/: ☜ خوسار

• **خویس** / -x(i)wîs/: ☜ ـ خوس[2]

**خویسان** / xuysan/: ☜ خوسان

**خویسانن** / x(i)wîsanin/: ☜ خوساندن

**خویسک** / xuysk/: ☜ خوسار

**خویسی** / xuysî/: نـاو. ١. کـاری خووسـاندن ٢. دۆخی خووسـیان 🇮🇷 ١. عمـل خیسـاندن ٢. حالـت خیس بودن

**خویشک** / x(i)wîşk/: ☜ خوشك

**خویشە** / xuyşe/: ناو. ڕەوتی شەقار ـ شەقار بـوونی زەوی کێلگ 🇮🇷 سلەشکنی

**خویگ** / xuyg/: ☜ **خوێگ**

**خوین** / xuyn, x(i)wîn/: ☜ **خوێن**[1]

**خویە** / xuye/: ☜ **خوشك**

**خوێ** / x(i)wê/: ناو. ١. خوا؛ خوەی؛ خێ؛ نمەک؛ پێکهاتەیەکی بلۆری لە کلورووری سودیوم، بە ڕەنگی سپی و تامی سوێرەوە کە بە زۆری لە سروشتدا دەست دەکەوێ و تامی چێشتە ٢. خاوەن؛ خێو ٣. سەرپەرشت ٤. خوشک؛ خۆیشک ☰ ١. نمک ٢. صاحب ٣. سرپرست ۴. خواهر

⊡ **خوێ بە برینەوە کردن**: /کنایە/ بە بەرەوە دان و کولاندنەوەی باسێکی ناخۆش ☰ نمک بر زخم پاشیدن

**خوێ پێوە کردن**: /کنایە/ پێوەنان؛ بە تام و چێژ گێڕانەوەی ڕووداوێک ‹جا ئیدی کاک ئازادیش ئەوەندەی دیکە خوێ پێوە دەکا› ☰ پیازداغش را زیاد کردن

**خوێ چەشتن/ چێشتن**: تام کردنی چێشت بە ئەزموونی سوێری ☰ چشیدن غذا

**خوێ دان**: خوێ بە ئاژەڵ دان ☰ نمک دادن به دام

**خوێ کردن**: تامدار کردنی خۆراک بە خوێ ☰ نمک ریختن در غذا

**خوێ کردنە خۆ**: دان بە خۆدا نان ☰ تحمل کردن

**خوێتاڵە** / x(i)wêtałe/: ناو. خواتیەلە ☰ نمک تلخ

**خوێچەژ** / x(i)wêçej/: ☜ **خوێچێژ**

**خوێچەش** / x(i)wêçeş/: ☜ **خوێچێژ**

**خوێچێژ** / x(i)wêçêj/: ناو. خوێچەژ؛ خوێچەش: ١. کاری تام کردنی چێشت بۆ دەرکەوتنی تامی ٢. کەسێ کە چێشت دەچێژێ تا بزانێ خوێی تەواوە. هەروەها: **خوێچێژی** ☰ ١. کار چشیدن غذا ٢. کسی که غذا را می‌چشد

**خوێدار** / x(i)wêdar/: ئاوەڵناو. خاوەندار؛ بە داژدار؛ بە ساحێب ☰ دارای صاحب

**خوێداری** / x(i)wêdarî/: ناو. سەرپەرشتی؛ ئاگاداری ☰ سرپرستی

**خوێدان** / x(i)wêdan/: ناو. خوادان؛ خوێدانک؛ نمەکدان؛ جێگەی خوێ لە بان سفرە ☰ نمکدان

**خوێدانک** / x(i)wêdanik/: ☜ **خوێدان**

**خوێدانە** / x(i)wêdane/: ناو. تێری خوێ؛ دەفری گەورە بۆ خوێ تێ‌کردن ☰ ظرف بزرگ نمک

**خوێڕایی** / x(i)wêřayî/: ☜ **خۆڕایی**

**خوێڕی** / x(i)wêřî/: ئاوەڵناو. خۆڕی؛ خۆڕی؛ خوێڕیلە؛ خێڕوو؛ خێری: ١. بێکارە ‹دایەگیان، کوڕی تۆش هێندە دەستەوەستان و خوێڕی نییە «سوارە»› ٢. بەرەڵا ‹وەک سەگی خوێڕی پەتی کەن «شێرکۆ»› ٣. هیچوپووچ؛ بێ‌کەڵک ‹من لە داخی خزمی خوێڕی و ئاشنای ئەحمەق هەڵاتم/ من لە ترسی زاق و زووقی ئەمنیەی چاوزەق هەڵاتم «هێمن»› ٤. بەدکارە؛ پەست ‹هەرچی پێت دەکرێ بکە ئەی دوژمنی خوێڕی و بزانە/ باوی لاوی کورد و تافی گەنجی ئازەربایجانە «هێمن»› ٥. بەرگەنەگر ‹من لە سەرمادا خوێڕیم› ☰ ١. بیکارە ٢. ولگرد ٣. بیهودە ۴. فرومایە ۵. ضعیف

**خوێڕیایەتی** / x(i)wêř(i)yayetî/: ☜ **خوێڕیگەری**

**خوێڕیگر** / x(i)wêřigir/: ئاوەڵناو. خوێڕی‌خواز؛ خوێڕی‌ویست؛ خوێڕی لە خۆ گر ‹چەن چکۆڵەن پەلەوەر لەو بەرزە/ ئاخ کە چەن خوێڕیگرە ئەم عەرزە «سوارە»› ☰ پست‌پرور

**خوێڕیگەری** / x(i)wêřigerî/: ناو. خوێڕییەتی؛ خوێڕیایەتی؛ خوێڕیەتی؛ کاری حیزانە و پەست ☰ فرومایگی

**خوێڕیلە** / x(i)wêřîle/: ☜ **خوێڕی**

**خوێڕی‌ویست** / x(i)wêřîwîst/: ☜ **خوێڕیگر**

**خوێڕییەتی** / x(i)wêřîyetî/: ☜ **خوێڕیگەری**

**خوێرێز** / x(i)wêřêz/: ☜ **خوێرێزگه**

**خـوێرێزگـه** / x(i)wêřêzge/: نـاو. خـــوێرێـــز؛ بەردەپانی لە سەری خوێ بە ئاژەڵ دان ☰ تخته سنگی که بر آن برای دام نمک پاشند

**خوێز** / x(i)wêz/: ☜ **خوسار**

**خوێژنگ** / x(i)wêjing/: ناو. هەڵە؛ سووچ ☰ اشتباه

**خوێس** / x(i)wês/: ☜ **خوسار**

**خوێش** / x(i)wêş/: ناو. خزم؛ کەس‌وکار؛ قـەوم ☰ خویش؛ فامیل

**خوێشـایەتی** / x(i)wêşayetî/: نـاو. خزمایـــەتی؛ کەسایەتی؛ خوێشی ☰ خویشاوندی

**خوێشک** / x(i)wêşk/: ☜ **خوشك**

**خوێشی** / x(i)wêşî/: ☜ **خوێشایەتی**

**خوێفرۆش** / x(i)wêf(i)roş/: ☜ **خوافرۆش**[1]

**خوێـک** / x(i)wêk/: نـاو. خـــووک؛ پیتـــاک؛ بـاجی میری ☰ باج و خراج

**خوێکراو** / x(i)wêk(i)raw/: ناوەڵناو. خوێ لـێدراو ☰ نمکسود

**خوێگ** / xwêg/: ناو. خویگ؛ خێو؛ خاوەن؛ خودان ‹باوەحیز خوێگ تا ئێستا لە کوێ بووی؟› ☰ صاحب

**خوێگە** / x(i)wêge/: ناو. شـوێنی خـوێ پێـدانی ئـاژەڵ ‹مێگەلەکـە ڕادە سـەر خوێگـە!› ☰ محـل ریختن نمک برای گله

**خوێل** / x(i)wêl/: ناوەڵـناو. ١. خوویـل؛ خێـل ٢. خوار؛ لار ☰ ١. لوچ ٢. کج

**خـوێلی** / x(i)wêlî/: نـاو. خێلـی؛ چـاڤـهـەولی ☰ لوچی

**خوێڵێن** / x(i)wêłên/: ناو. کانی خوێ؛ شوێنێ کە خوێی لێوە دێنن ☰ معدن نمک

**خـوێن**[1] / x(i)wên/: نـاو. خـێن؛ خـین؛ خـوین؛ خووین؛ خوون؛ خوەن: ١. هوون؛ ونی؛ تراوێکـی سوورە، دڵ و دەماری بربـڕەداران پـڕ دەکاتـەوە، ئۆکسیژن و ماکی خۆراکی دەگەیێنێتە ئەنـدامان و ماکی زیادەیان لێوە دوور دەخاتەوە ٢. یەک لە چوار خڵتی سەرەکی لەش، بە پێی بژیشکی کۆن (سـێتریـان: بەڵـغەم، سـەفرا، سـەودا) ٣. *[مەجاز]* قەڵتوبـڕ؛ کوشـتوبـڕ ☰ ١و٢. خـون ٣. کُشـت و کُشتار

⊡ **خوێن بژاردن**: خوێنبایی دان ☰ خونبها دادن

**خوێن بەر بوون**: خوێن لێ هاتن ☰ خون آمدن

**خـوێن بەربەست کـردن**: *[کینایـە]* داکوژانـــدنی دوژمنایەتی ☰ پایان دادن به دشمنی

**خوێن بەر چاو گرتن**: *[کینایە]* خـوێن پەڕینـە بـەر چاو؛ ئاگر لە ناو چاو کەسێ بارین؛ بە هۆی ڕق و قینەوە کەوتنە تەمای کوشـتنی کەسـێکەوە ☰ خون جلو چشم کسی را گرفتن

**خوێن بـەردان**: ١. حەجامەت کـردن؛ کەڵەشـاخ کـردن ٢. خـوێن لـێ هێنـان ☰ ١. حجامـت کشیدن ٢. خون آوردن

**خوێنبەست کردن**: بەر بە خوێن چـوون گـرتن ☰ خون را بند آوردن

**خوێن ڕژان**: خوێن بـە هـەموو لایەکـدا ڕژان ☰ خون پاشیدن

**خوێن تـێزان**: خوێن لە ژێر پێست کۆ بوونەوە بە هۆی گوشار یا زەربەوە ☰ خون جمع شدن

**خوێن جمان/ جومان**: *[کینایە]* زۆر تـوورە بـوون ☰ بسیار عصبانی شدن

**خوێن داکوژان**: *[کینایە]* ڕەوتی یـەک کـەوتن بـە مەبەستی کۆتایی هێنانی شـەڕ و دوژمنایـەتی ☰ ترک کردن مخاصمه

**خوێن داکوژانـدن**: *[کینایە]* شـەڕبەسـت کـردن ☰ آتش‌بس کردن

**خوێن دان**: ١. بەخشـینی خـوێن بـۆ نەخۆشـی ئاتاجی بە خوێن ‹گشت ڕۆشـتین خوێنمـان دا› ٢. *[کینایە]* گیان بەخت کردن؛ لە گیان بگـردن ☰ ١. خون اهداء کردن ٢. جانفشانی کردن

**خوێن ڕژان**: ١. کوژران؛ کوژیان ‹خوێن ڕژا، ڕۆڵە کوژا، کەللە پژا/ خوێن ڕژان خۆشە کە ئابڕوو نەڕژا «هەژار، بۆ کوردستان»› ٢. *[کینایە]* ئاوری شەڕ هەڵاییسان ≅ ١. کشته شدن ٢. جنگ و خونریزی شدن

**خوێن ڕژاندن/ ڕژانن/ ڕژتن**: مرۆ کوشتن ≅ آدم کشتن

**خوێن کردن**: *[کینایە]* مرۆ کوشتن ≅ آدم کشتن

**خوێن کردنە کاسەوە**: *[کینایە]* جزیا دان و زۆر بۆ هێنان ≅ اذیت و آزار دادن

**خوێن کوژاندنەوە**: *[کینایە]* خوێن کوژانەوە؛ خوێن داکوژاندن ≅ آشتی دادن دشمنان خونی

**خوێن کوژانەوە**: ☜ **خوێن کوژاندنەوە**

**خوێن گرتن**: ١. خوێن بەردان ٢. تێکچوون و شێوان بە دیتنی خوێن ≅ ١. رگ زدن؛ حجامت گرفتن ٢. بی‌حال شدن از دیدن خون

**خوێن لوت بەر بون**: ١. خوێن لە لووت هاتن ٢. *[کینایە]* ئازاری کەم پێ‌گەییشتن ≅ ١. خون‌دماغ شدن ٢. آسیب مختصر دیدن

**خوێن لە چاوی کەسێک بارین**: *[کینایە]* ١. زۆر بێبەزە و دڵڕەق بوون ٢. زۆر تووڕە بوون ≅ ١. خون از انگشتان کسی چکیدن ٢. بسیار عصبانی شدن

**خوێن لە لوتی کەسێ نەهاتن**: *[کینایە]* بە کەسێک کەمترین وەزەنگ نەگەیشتن ≅ خون از دماغ کسی نیامدن

**خوێن لێهاتن**: خوێن هاتن ≅ خون‌آلود شدن

**خوێن وێستانەوە**: وێستانی خوێن لە ئەندامی بریندار ≅ خون بند آمدن

**خوێن هەڵاوردنەوە**: ☜ **خوێن هەڵێنانەوە**

**خوێن هەڵێنان**: ☜ **خوێن هەڵێنانەوە**

**خوێن هەڵێنانەوە**: خوێن هەڵاوردنەوە؛ خوێن هەڵێنان: ١. خوێن ڕشانەوە ٢. *[کینایە]* زۆر دلگران بوون ≅ ١. خون بالا آوردن ٢. بسیار ناراحت شدن

**خوێنی دڵ خواردن**: *[کینایە]* ڕەنج و ئازار و خەفەتی زۆر کێشان ≅ رنج و غم بسیار دیدن

**خوێنی کەسێ کردنە کاسەوە**: *[کینایە]* زۆر بۆ کەسێک هێنان و ئازاردانی ‹گرانفرۆشان خوێنی خەڵکیان کردۆتە کاسەوە› ≅ خون کسی را در شیشه کردن

**لە خوێنی خۆدا گەوزین**: *[کینایە]* خوێن لێ ڕژانی زۆر ≅ در خون خود غلتیدن

ـ **خوێن**[٢]: پاشەوشە. ـ خێن ‹دۆعاخوێن› ≅ ـ خوان

**خوێنئەستێن** / x(i)wên'estên/: ناو. تۆڵەستێن ≅ انتقامگیر

**خوێنالی** / x(i)wênalî/: ☜ **خوێناوی**

**خوێناو** / x(i)wênaw/: ناو. ١. خوێنێ کە لە گەروو دێت ٢. هووناو؛ خوێنی تێکەڵ بە ئاو ≅ ١. خونی که از گلو آید ٢. خونابه

⊡ **خوێناو هەڵێنان**: خوێن ڕشانەوە ≅ خون بالا آوردن

**خوێناوڵ** / x(i)wênawił/: ئاوەڵناو. خوێناوڵین؛ خوێن پێوە تلاو ≅ خون‌آلود

⊡ **خوێناوڵ بون**: خوێن لێ‌هاتن؛ خوێن شتێ داگرتن ≅ خون‌آلود شدن

**خوێناوڵی** / x(i)wênaw(i)łî/: ☜ **خوێناوی**

**خوێناوڵین** / x(i)wênaw(i)łîn/: ☜ **خوێناوی**

**خوێناوی** / x(i)wênawî/: ئاوەڵناو. خوێنین؛ خوێناوڵین؛ خوێنالی؛ خوێناوڵی؛ خینالی؛ خوێن پێوە تلاو ≅ خون‌آلود

**خوێنبایی** / x(i)wênbayî/: ناو. خوێنبژی؛ خوێنسۆل؛ سەربەها؛ خیسل؛ نرخی خوێنی کوژراو کە لە مرۆکوژ (یان خزمانی) دەسێنرێ ≅ خونبها

**خوێنبرا** / x(i)wênb(i)ra/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی

دوو کەس کە خوێنی باسکی یەکتر تێکەڵ دەکەن و دەبنە برای خوێنی ⇐ برادری با پیمان خونی

**خــوێنبڕ** / x(i)wênbiř/: ئاوەڵــناو. بــــه تایبەتمەندییــەکی وا بــەری خــوێن بگــرێ ⇐ خون‌بند

**خوێنبژی** / x(i)wênb(i)jî/: ☜ **خوێنبایی**

**خوێنبەر** / x(i)wênber/: نــاو. دەمــاری خــوێن ڕاگوێز لە لەشدا ⇐ شریان

**خوێن‌بەردەر** / x(i)wênberder/: ناو. حەجامات‌کێش؛ وەستای خوێن بەردان ⇐ حجامت‌کار

**خوێنبەس** / x(i)wênbes/: نــاو. خوێنبەســت: ١. ڕەوتی وێســتانی خــوێن لــە ئەنــدام ٢. *[کینایە]* ئاگربەس؛ تەقەبەس ⇐ ١. فرایند بند آمدن خون ٢. آتش‌بس

**خوێنبەست** / x(i)wênbest/: ناو. ☜ **خوێن‌بەس**

**خوێن‌پـاڵێن** / x(i)wênpałên/: نــاو. شـــاتەڕە؛ شەتەڕە؛ شیرین‌شاتەڕە ⇐ شاهتره

**خوێنتاڵ** / x(i)wêntał/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ڕەزاگــران؛ زەڕەگران؛ ئێسک‌قورس ⇐ گرانجان

**خوێن‌جمان** / x(i)wênc(i)man/: ناو. خوێن‌جومان: ١. تەوژمی خوێن ٢. *[کینایە]* هەڕەتی بــەهار ⇐ ١. فشار خون ٢. موسم بهار

**خوێن‌جومان** / x(i)wêncuman/: ☜ **خوێن‌جمان**

**خوێنخـوا** / x(i)wênx(i)wa/: ئاوەڵــناو. خوێنــەخۆ؛ داواکاری تۆڵەی کوژراو ⇐ خونخواه

**خوێنخوار** / x(i)wênx(i)war/: ئاوەڵناو. ١. *[مەجاز]* دوژمــنی خــوێنی ٢. *[مەجاز]* مرۆکــوژ ٣. بــە تایبەتمەندی خــواردن لــە خــوێنی گیانــەوەرانی گەرمەخوێنــەوە (وەک: زالــوو و هەنــدێک لــە شەمشەمەکوێران) ⇐ ١. دشمن خونی ٢. آدمکُش ٣. خونخوار (جانور)

**خوێنخـواری** / x(i)wênx(i)warî/: نــاو. *[مەجاز]* ١. دوژمنایەتی تۆخ ٢. زاڵمی ⇐ ١. دشمنی خونی ٢. ستمگری

**خوێنخۆر** / x(i)wênxor/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* مرۆکـوژ ⇐ آدمکُش

**خوێندادەر** / x(i)wêndader/: ☜ **خوێن‌دەڵێن**

**خوێنـدران** / x(i)wênd(i)ran/: چاوگ. خوێنران ⇐ خوانده شدن

**خوێندرانــەوە** / x(i)wênd(i)ranewe/: چــاوگ. تێپەڕ. نادیار. //خوێندرایــەوە؛ دەخوێندرێیــەوە؛ بخوێندرێوە// خوێنرانەوە ⇐ خوانده شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: خوێندراوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەخوێندرانەوە

**خوێندکار** / x(i)wêndkar/: ناو. قوتابی؛ خۆنـدکار ⇐ مُحصل

**خوێندگە** / x(i)wêndge/: ☜ **خوێندنگە**

**خوێندن** / x(i)wêndin/: چاوگ. تێپەڕ. //خوێنـدت؛ دەخـوێنی؛ بخوێنــە// خونـدن؛ خۆنـدن؛ خـۆنن؛ خوەنن؛ خێندن: ١. خوێندنەوە؛ وانـایوە ‹کتێب خوێندن› ٢. چرین؛ وانـەی؛ گوتنـەوەی شـیعر و نووسراوە بە ئاهەنگەوە ‹کوندەبوو خوێندی لە شـاخ و بولبول و قومری لە باخ/ هەریەکێ هاوار ئەکا: وا بـا خەلات پەخشان ئەکا «ئاوات»› ٣. فێر بوون؛ واناى ‹کیمیام خوێندووە› ⇐ خواندن: ١. مطالعه کـردن ٢. آواز خواندن ٣. آموختن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەخوێندن

**خوێندنگـــە** / x(i)wêndinge/: نـــاو. خوێندگـــە؛ خۆندگا؛ خۆندنگا؛ فێرگە؛ مەکتەب؛ مەدرەســە ⇐ آموزشگاه

**خوێندنەوە** / x(i)wêndinewe/: چاوگ. خۆندنەوە؛ خۆننەوە: ١. خوێندن ٢. دیسانەوە خوێندن ⇐ ١. خواندن ٢. بازخواندن

**خوێندە** / x(i)wênde/: ☜ **خوێندەوار**

**خوێندەڤان** / x(i)wêndevan/: ☜ **خوێندەوار**

**خــوێن‌دەڵــێن** / x(i)wêndełên/: ئاوەڵــناو. خوێن‌دادەر؛ تایبەتمەندی ئەوەی خوێنی لە بەر بڕوا ≍ خون‌چکان

**خوێنـدەوار** / x(i)wêndewar/: ئاوەڵناو. خوێنـدە؛ خوێنـەوار؛ خۆنـدەوار؛ خۆنـدەوان؛ خۆنـدی؛ خوەنەوار؛ خوێندەڤان؛ خوویندەڤان؛ خۆنەوار: ١. باسەواد؛ خاوەن توانایی خوێندن و نووسین ‹ئەی کچـی جـوان! کچـی لـەبار!/ ئـەی کچـی زانـا و خوێنـدەوار! «هـێمن»› ٢. خـاوەن خوێنـدن و هەڤۆتی زانستی (لای کـەم تـا پلـەی دواناوەنـدی) ‹لاوانی خوێندەوار لە بێکاریدا خـەریکی کۆڵـبەری و دەسفرۆشین› ≍ ١. باسواد ٢. تحصیلکردە

**خوێنـدەواری** / x(i)wêndewarî/: نـاو. خۆنـەواری؛ خوەنـەواری: ١. سـیوات‌داری ٢. ئـەوەی لـە دامەزراوەیـەکی فێرکاریـدا بـە دەسـت هـاتووە ‹خوێندەواری بە زمانی کـوردی› ≍ ١. باسـوادی ٢. تحصیلات

**خـوێنران** / x(i)wênran/: چـاوگ. خوێنــدران ≍ خوانده شدن

**خوێنرانـــەوە** / x(i)wênranewe/: چــــاوگ. خوێندرانەوە ≍ خوانده شدن

**خوێنڕژ** / x(i)wênřij/: ☜ **خوێنڕێژ**

**خوێنڕێژ** / x(i)wênřêj/: ئاوەڵناو. خوێنڕژ؛ مرۆکـوژ ≍ آدمکش

**خوێنڕێژی** / x(i)wênřêjî/: ناو. ١. ڕزک؛ دۆخ یـان چۆناوچۆنی پژانی خوێن لە ڕەگـەوە ‹خوێنـڕێژی نـاوەکی› ٢. *[کینایـە]* سـتەمکاری؛ کـار و ڕەوتی خوێن ڕشتن و مرۆ کوشتن ‹شـەڕ و خوێنـڕێژی› ≍ ١و٢. خونریزی

**خوێنســارد** / x(i)wênsard/: ئاوەڵـــناو. ١. بـــە تایبەتمەندی بەند بوونی تینی لەش بـە دەمـای ئاقـارەوە ‹مـار و ماسـی خوێنسـاردن›. بەرانبـەر: **خوێنگەرم** ٢. *[مەجاز]* لەسەرخۆ؛ پشوودرێژ؛ توانا لە بەر خۆ گرتن و ڕاگـیردانی هەسـتی دەروون لـە هەمبەر ڕووداوی دوور لە چاوەڕوانییـەوە ≍ ١و٢. خونسرد

**خوێنســـاردی** / x(i)wênsardî/: نـــاو. *[مــەجاز]* پشوودرێژی؛ سەبر و حەوسەڵە ≍ خونسردی

**خوێنساز** / x(i)wênsaz/: ئاوەڵناو. بە تایبەتمەندی یان توانایی زۆرکردنەوەی ڕێژەی هیمۆگلوبین لە خوێندا ≍ خونساز

**خوێنسۆل** / x(i)wênsol/: ☜ **خوێتبایی**

**خوێنسوک** / x(i)wênsûk/: ☜ **خوێن‌شیرین**

**خوێنشیرن** / x(i)wênşîrin/: ☜ **خوێن‌شیرین**

**خوێن‌شـیرین** / x(i)wênşîrîn/: ئاوەڵــناو. *[مــەجاز]* خــوێن‌شــیرن؛ خــوێن‌ســووک؛ ڕەزاســووک؛ ئێسک‌سووک ≍ دوست‌داشتنی

**خوێنکەر** / x(i)wênker/: ناو. پیـاوکوژ؛ مێرکـوژ ≍ قاتل

**خوێنگر** / x(i)wêngir/: نـاو. ١. خزمی پلـە یـەکی کـوژراو ٢. ئـەوی خـوێن بـۆ تـاقی کردنـەوە لـە دەماری نـەخۆش دەگـرێ ≍ ١. اقـوام درجـه اول مقتول ٢. خونگیر

**خوێن‌گرتـو** / x(i)wêngirtû/: ئاوەڵـناو. شـێواو لـە دیتنی خوێن. هەروەها: **خوێن‌گرتوویی** ≍ بی‌حال از مشاهدەی خون؛ خون‌هراس

**خـوێنگری** / x(i)wêng(i)rî/: نـاو. کـار و ڕەوتی گرتنی خوێن لە گیاندار (مرۆ یان حەیوان) بۆ تاقی کردنەوە، گۆزانەوە یان دەرمان ≍ خونگیری

**خوێنگەرم** / x(i)wêngerm/: ئاوەڵناو. خوونگـەرم: ١. بە تینی لەشی تا ڕادەیەک نەگۆڕ لە بەرانبـەر گۆڕانی دەمای ئاقـارەوە. بەرانبـەر: **خوێنسارد** ٢. *[کینایە]* زوو هەڵـچوو ٣. *[مەجاز]* سـوور لـە سـەر مەبەست ≍ ١. خونگرم ٢. زودرنج ٣. مُصر

**خوێنگـەرمی** / x(i)wêngermî/: نــاو. *[کینایــە]* دلاوەری؛ ڕۆح‌سووکی؛ دۆخی بە هەست و نەست

بوون ☰ خونگرمی

**خـوێنگیر / x(i)wêngîr/:** ئاوەڵـناو. ١. خـــواگیری کوشتنی ناڕەوا ٢. شێواو لە دیـتنی خـوێن ☰ ١. دچار مُصیبت از قتل ناروا ٢. بی حـال بـر اثـر دیـدن خون

**خـوێنمژ / x(i)wênmij/:** ئاوەڵـناو. ١. خوێنخـــوار؛ خوێنخۆر؛ خوێنڕێژ؛ گۆنجـڕ؛ دەڤـڵخووین؛ زاڵـم؛ مرۆکـوژ؛ خوازیـاری کوشـتن و خـوێن ڕژانـدن ‹میری خوێنمژ› ٢. بە تایبەتمەندی خـواردن لـە خوێنی گیانەوەرانی گەرمەخوێنەوە (وەک: زالوو و هەندێک لە شەمشەمەکوێران) ☰ ١و٢. خونخوار

**خـــوێنمژی / x(i)wênm(i)jî/:** نـــاو. گۆنجـــــڕی؛ خوێنخواری؛ گووجکاری؛ سـتەمکاری؛ دۆخ یـان چۆنیەتی خوێنمژ بوون ☰ خونخواری

**خوێنناسی / x(i)wênnasî/:** ناو. لقـێ لـە زانسـتی ژیناسی، سەبارەت بـە خـوێن و پێکهاتـەکانی ☰ خون‌شناسی

**خوێن‌وخوڕ / x(i)wên û xuř/:** ناو. خوێنی زۆر و بە لێشاو ☰ موج خون

**خوێن‌وگۆشت / x(i)wên û goşt/:** ناو. *[مەجاز]* لەش؛ گۆڤدە؛ تەن ☰ بدن

**خوێنـــەخوار / x(i)wênex(i)war/:** ئاوەڵـــــناو. خوێنـەخوارە؛ خوێنـەخوێ؛ خووینـەر ☰ دشـمن خونی

**خوێنــــــــەخوارە / x(i)wênex(i)ware/:** ☜ خوێنەخوار

**خوێنەخوێ / x(i)wênex(i)wê/:** ☜ خوێنەخوار

**خوێنەخۆ / x(i)wênexo/:** ☜ خوێنەخوا

**خوێنەدووبراکـــە / x(i)wênedûb(i)rake/:** نـــاو. دارێکـە بەرەکـەی سـوورە، بـۆ ڕەنـگ دەبـێ ☰ درختی با میوەی قرمز کە مصرف رنگرزی دارد

**خوێنەوار / x(i)wênewar/:** ☜ خوێندەوار

**خوێنەونـــەرە / x(i)wênewnere/:** ئاوەڵـــــناو. خوێنەونێرە؛ لەککاتە؛ لەیلەدۆنێ؛ سەڵیتە ☰ لکّاتە

**خوێنەونێرە / x(i)wênewnêre/:** ☜ خوێنەونەرە

**خـوێنی / x(i)wênî/:** ئاوەڵـناو. پێوەندیـــدار بـــە خوێنەوە ‹نەخۆشی خوێنی› ☰ خونی

**خوێنین / x(i)wênîn/:** ☜ خوێناوی

**خوێواوک / x(i)wêwawik/:** ناو. ئـاوخوێ؛ ئـاوخوا؛ خوێ لە ئاودا ☰ آب نمک

**خوێـه / x(i)wêh/:** ناو. خۆ؛ ئارەقە ☰ عرق

▣ **خوێـه دان:** خـۆه دان؛ عـارەق کـردن ☰ عـرق کردن

**خۆ[1] / xo/:** ناو. ١. خوو؛ خدە؛ ئەخلاق؛ چۆناوچۆنی ئاکار و هەڵس‌وکەوتی مرۆ لە نێو کۆمەڵـگادا ‹بـە خەنجەر دلمی لەت‌لەت کرد کە بێ ئۆق/ وتی خـۆ وا خـراپ و دل وەهـا چـاک «مـەحوی»› ٢. خـود؛ شەونم؛ ئاونگ؛ خنـاف ٣. خـوە؛ خـود؛ ئارەقـەی لەش ☰ ١. خو؛ اخلاق ٢. شبنم ٣. خوی؛ عرق بدن

**خۆ[2]:** ئاوەڵناو. خۆیی؛ خۆمانە ☰ خودی

**خۆ[3]:** جێناو. ١. خوە؛ خە؛ وێ؛ خود؛ سـەرجەم ئـەو شتانەی (وەک: لەش، هـزر، بـیر و ...) کەسـێ یـا بوونەوەرێکیان پێک‌هێناوە ‹خۆ دان لە قـەپان› ٢. یەک بوونەوەر بە تـەنێ و بـێ بەشـداری ئـەوانی دیکە ‹لای خۆیەوە بیری کردەوە› ☰ ١و٢. خود

▣ **خۆ بـادان:** ١. خۆ هەڵسووڕاندن ٢. سـەربزێوی کـــردن ٣. *[کینایـە]* ئـەملا و ئـەولا کـردن؛ دەسـاودەس کـردن ☰ ١. تـاب دادن خـود ٢. سرپیچی کردن ٣. تعلل کردن

**خۆ بە دەستەوە دان:** خۆ تەسلیم کردن ☰ خود را تسلیم شدن

**خۆ بە زل زانین:** *[کینایە]* خۆ هەڵکێشان؛ لـە خـۆ بایی بوون و خۆ هەڵدان ☰ خود را بالا گرفتن

**خۆ بە کەم زانین:** *[کینایە]* توانایی یان شیاوی خۆ کەمتر لەوەی هەیە هاتنە بەرچاو ‹تۆ خـۆت بـە کەم زانیوە› ☰ خود را دست کم گرفتن

**خۆ پێ ڕاگیران:** ☜ **خۆ ڕاگرتن ـ۱**

**خۆ تێگرتن:** *[کینایە]* بەشدار بوون بۆ قازانج بـردن ▆ شراکت کردن برای سود بردن

**خۆ تێگەیانـدن:** *[کینایە]* ۱. خۆ نیشان دان ۲. خۆ تێوەردان؛ خۆ تێ‌هەڵقورتان ▆ ۱. خود را نشـان دادن ۲. دخالت کردن

**خۆ تێوەردان:** ☜ **خۆ تێ‌گەیاندن ـ۲**

**خۆ تێ‌هەڵقورتان:** ☜ **خۆ تێ‌گەیاندن ـ۲**

**خۆ خستنە مالی کەسێک:** *[کینایە]* خۆ خستنە مـل دەس و پای کەسێکدا؛ پەنا بردنە بەر کەسێک و یاری لێ خواستنی ▆ خود را به دامـن کسـی انداختن

**خۆ خواردنەوە:** *[مەجاز]* پیش خواردنەوە لە خەم و خەفەتان ▆ خودخوری کردن

**خۆ خوراندن:** *[پلار]* خۆ ئامادە کردن بۆ بەخشین ▆ دست به جیب بردن

**خـۆ دانـە دەسـەوە:** *[کینایـە]* ورە بـەردان؛ نـەمانی دەسەڵات بە سـەر کـردار و گوتـاری خـۆدا ▆ خود را باختن

**خـۆ دۆڕانـدن:** *[مـەجاز]* ۱. ورە بـەردان ۲. خـۆ فرۆشتن ▆ ۱. خود را باختن ۲. مُزدور شدن

**خۆ دۆزین:** کـار و ڕەوتی لـە خـۆ کۆڵـینەوە ▆ خودکاوی کردن

**خۆ دەرکردن:** لـە مەترسـی دەربـاز بـوون ▆ از معرکه گریختن

**خۆ ڕاگرتن:** خۆ گیر دان: ۱. خـۆ پـێ‌ڕاگـیران؛ پشوودرێژی کردن؛ سەبر کردن ‹خۆمم ڕاگـرت و هیچم نەگوت› ۲. بەرگە گرتن ‹کەس لـە بـەر زیللەم خۆی ڕانـاگرێ› ۳. ڕاوەسـتان؛ بـەردەوام بـوون ‹سالـەهایە خـۆی ڕاگرتـووە و بـەم بایانـە نالەرزێ› ▆ ۱. تحمل کردن ۲و۳. دوام آوردن

**خۆ ڕانان:** ۱. خۆ کێش کـردن بـەرەو پـێش ۲. *[مەجاز]* خۆ هەڵکێشان ▆ ۱. خود را جلو کشـیدن ۲. فخر فروختن

**خۆ ڕێ‌خستن:** خۆ ڕێک‌خستن؛ خۆ شیرین کردن ▆ خودشیرینی کردن

**خۆ ڕێک‌خستن:** ۱. خۆ هەماهەنگ کـردن؛ ڕێـک خســتنی خــۆ لەگــەڵ دیکــەی ئەنــدامانی کۆمەڵێک ۲. ☜ **خـۆ ڕێ‌خسـتن** ۳. خـۆ لـە یەکتر هەڵساوین ▆ ۱. خود را هماهنـگ کـردن ۲. ☜ **خۆ ڕێ‌خستن** ۳. خود را به هم سایدن

**خۆ شاردنەوە:** خۆ حەشار دان ▆ مخفی شدن

**خۆ فرۆشتن:** *[کینایە]* ۱. حیزی کردن ۲. خزمەت کردن بە بێگانە ▆ ۱. تن‌فروشی کردن ۲. مُـزدور بیگانه شدن

**خۆ گرتن:** *[کینایـە]* دەمـار فرۆشـتن؛ لووتبـەرزی کردن ▆ تکبر نمودن

**خۆ گنخانـدن:** خۆ مات کردن و کـار تۆپانـدن ▆ وقت‌کشی کردن

**خۆ گیر دان:** ۱. خۆ بە شـتێکەوە نووسـاندن ۲. ☜ **خۆ ڕاگرتن** ▆ ۱. خود را نگهداشـتن ۲. ☜ **خۆ ڕاگرتن**

**خـۆ لـە تـەپڵی گـوڵێ دان:** *[مـەجاز]* خــۆ پــیس ڕازاندنەوە ▆ آرایش غلیظ کردن

**خۆ لە خوارەبایان گرتن:** *[کینایە]* خـۆ لـێ گێـل کردن؛ خـۆ لـێ‌نـەدان ▆ خـود را بـە کوچـەی علی‌چپ زدن

**خۆ لە دار و بەرد دان:** *[کینایە]* هـەوڵ دانی زۆر و خۆ خستنە مەترسییەوە ▆ خود را به آب و آتش زدن

**خۆ لە دەسک نـان:** *[کینایە]* خـۆ بـە کەسـێکەوە هەڵواسین و لەگەڵ کەوتنی ▆ خود را بر کسی تحمیل کردن

**خۆ لە قەرەی کەسێ نەدان:** لـێ بـڕان و تخـوونی کەسێ نەکەوتن ▆ طرف کسی نرفتن

**خۆ لە گەز دان:** *[کینایە]* خـۆ درێـژ کـردن ▆ دراز

کشیدن
**خۆ له ماڵ خستن**[کنایه] حاشا کردن ⇐ ترک خانه‌ی شوهری کردن
**خۆ له ماڵی کەسێ خستن**[کنایه] بۆ ئاشت بوونه‌وه خۆ خستنه ماڵی کەسێ ⇐ برای آشتی کردن پناه به خانه‌ی کسی بردن
**خۆ لێبواردن** چاوپۆشی کردن ⇐ اغماض کردن
**خۆ لێ به پشتدا خستن**[کنایه] گوێ پێ‌نه‌دان ⇐ توجه نکردن
**خۆ لێخۆش کردن**[کنایه] ته‌ماح کردن ⇐ طمع کردن
**خۆ لێدان** ۱. خۆ پێدادان ۲. خۆ له کارێ دان ⇐ ۱. برخورد کردن ۲. وارد کاری شدن
**خۆ (لێ)گۆڕین** ڕابردووی خۆ له بیر بردنه‌وه یان خۆ لێی لادان و ئاوڕ نه‌دانه‌وه له دۆستان و خوێشان ⇐ خود را گم کردن
**خۆ لێ گێل کردن** ☜ **خۆ له خواره‌بایان گرتن**
**خۆ لێ نه‌دان** ۱. خۆ پێدا نه‌دان ۲. خۆ تێ نه‌گه‌یاندن ⇐ ۱. طرف چیزی نرفتن ۲. دخالت نکردن
**خۆ لێهه‌ڵکردن** قۆڵ لێ هه‌ڵماڵین؛ ده‌ست پێکردن ⇐ همت کردن و دست به کار شدن
**خۆ مه‌لاس دان** خۆ مات کردن ⇐ ساکت و بی‌حرکت شدن
**خۆ نواندن** خۆ نیشان دان ⇐ خودنمایی کردن
**خۆ هه‌ڵداشتن** خۆ فڕێ دان ⇐ خود را پرت کردن
**خۆ هه‌ڵشه‌نگاندن**[مه‌جاز] شانازی به خۆوه کردن ⇐ به خود بالیدن
**خۆ هه‌ڵکێشان** ۱. چاپ لێدان؛ به خۆدا هه‌ڵگوتن ۲. خۆ ڕێک‌وپێک کردن (جل‌وبه‌رگ) ‹دا تۆزێ خۆت هه‌ڵکێشه! ئه‌وه چییه؟ ده‌ڵێی شێتی› ⇐ ۱. لاف زدن ۲. خود را جمع و جور کردن
**کێشانه سه‌ر خۆ**[کنایه] وا بیر کردن که ڕووی قسه له تۆیه ⇐ به خود گرفتن
**له خۆوه ده‌رهێنان** هه‌ڵبه‌ستن ⇐ از خود درآوردن
**هاتنه سه‌ر خۆ** هۆش هاتنه به‌ر؛ وه خۆدا هاتن؛ به ده‌س هێنانه‌وه‌ی هۆشیاری یان هێوری خۆ ⇐ به خود آمدن
**خۆ**[۴]: ئامراز. ۱. ئیسه ‹وه‌ره ماچێکم ده‌یه! خۆ دنیا کاول نابێ؛ خۆ تێرت خوارد، ئیدی چیت ده‌وێ؟› ۲. ئه‌گه‌ر؛ ئه‌گه‌ریش ‹وتی جێبه‌جێ ده‌که‌م، خۆ نه‌شیکرد تۆ خۆش؛ هات باشتر، خۆ نه‌یشهات چش!› ۳. بۆ پێداگری و دان پێدانان ‹دوڵ‌به‌ر دڵ ئه‌ستانای جه من، شه‌رت ئی دڵستانی نیۆ/ جه‌ورش مه‌ده‌ی! ڕه‌نجش مه‌که‌ر! خۆ کافرستانی نیۆ «سه‌یدی»› ٤. هه‌ر؛ ئه‌گه‌ر ‹خۆ ده‌م بکه‌یته‌وه ئه‌تکوژن!› ٥. به‌ڵام؛ به‌س ‹وامزانی ئازای! خۆ زۆر خاوی!› ٦. ئه‌وه‌تا ‹خۆ بۆ من نه‌بوو!› ⇐ **مُلاحظه:** این حرف اضافه معادل دقیقی در زبان فارسی ندارد و بیشتر می‌توان به حالات آن اشاره داشت ۱. حالا؛ با این حال ۲. اگر؛ اگر که ۳. که ۴. همین که؛ چون ۵. اما؛ حال آنکه ۶. به هر حال
**خۆ**[۵]: پێشوه. ۱. پێوه‌ندیدار به هه‌مان که‌س یان شته‌وه ‹خۆبه‌زل‌زان› ۲. به یارمه‌تی هه‌ر ئه‌و شته‌ی ئاماژه‌ی بۆ کراوه، نه شتێکی‌تر ‹خۆتاش؛ خۆمه‌ش› ۳. دێته سه‌ر زۆرێک چاوگ و چاوگی لێکدراو پێک دێنێ ‹خۆسووتاندن› ⇐ ۱و۲. خود ۳. با مصدر، مصدر مرکب می‌سازد
**خۆبان** / xoban/: ئاوه‌ڵناو. ناهومێد؛ دڵسارد ⇐ نومید
**خۆبایی** / xobayî/: ئاوه‌ڵناو. بادی‌هه‌وا؛ خۆگر؛ به‌رزاخوڕ ⇐ مغرور
**خۆبزێو** / xob(i)zêw/: ئاوه‌ڵناو. ئوتوماتیک؛ خۆمه‌ش ⇐ اتوماتیک
**خۆبژیو** / xob(i)jîw/: ئاوه‌ڵناو. خۆژی؛ سه‌ربه‌خۆ؛

بێنیاز لە کەس 🇮🇷 خودکفا

**خۆبژیوی** / xob(i)jîwî/: ناو. خۆژیوی؛ سەربەخۆیی ئابووری 🇮🇷 خودکفایی

**خۆبوێری** / xob(i)wêrî/: ناو. پارێز؛ دوورەپەرێزی 🇮🇷 پرهیز

**خۆبویی** / xobûyî/: ناو. سەربەخۆیی؛ سەربەستی؛ سەرازایی 🇮🇷 استقلال

**خۆبەزلزانی** / xobezilzanî/: ناو. قوڵمی 🇮🇷 غرور

**خۆبین** / xobîn/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **خۆپەرست** ٢. ☜ **خۆخوا**

**خۆبینی** / xobînî/: ناو. فیز؛ دەعیە؛ بادیهەوایی؛ خوو یان ئۆگرەتی زەینی بەوەی کەسێک خۆی باشتر و بەرزتر لە دیتران بزانێ 🇮🇷 خودبینی

**خۆپارێز** / xoparêz/: ئاوەڵناو. ١. دوورەپەرێز ٢. لە خواترس 🇮🇷 ١. مُحتاط ٢. پرهیزکار

**خۆپارێزی** / xoparêzî/: ناو. ١. کاری لە سەر خۆ بە جواب هاتن ٢. دوورەپەرێزی ٣. کاری دوور گرتن لە کاری ناپەسند 🇮🇷 ١. دفاع از خود ٢. احتیاط ٣. پرهیزکاری

**خۆپان**[١] / xopan/: ناو. ١. تەوەزەلی؛ تەمەڵی ٢. خۆپە؛ عێل و عەشرەت ٣. وێرانە؛ کەلاوە ٤. ئۆبە؛ جێ هەواری ئاوەدان 🇮🇷 ١. تنبلی ٢. عشیرت ٣. ویرانه ۴. محل ییلاق ایل

**خۆپان**[٢]: ئاوەڵناو. خۆبان؛ داماو؛ ناهەمێ؛ کلۆل 🇮🇷 بیچاره

**خۆپە** / xope/: ناو. خۆپان؛ هۆز؛ عەشرەت 🇮🇷 عشیرت

**خۆپەرس** / xoperis/: ☜ **خۆپەرست**

**خۆپەرست** / xoperist/: ئاوەڵناو. خۆبین؛ خۆپەرس؛ خۆخواز؛ خاوەن خوو یان ئۆگرەتی بە خۆپەرستی ‹لە کوێ حاڵی من و تۆ وا دەبوو ئەی خۆپەرست ئێستا/ ئەگەر دینا ئوسوول و قاعیدە و نەزم و حیسابی با «هێمن»› 🇮🇷 خودپرست

**خۆپەرستی** / xoperistî/: ناو. خۆخوازی؛ خۆبینی؛ خوو یان وازی خۆ لە هەموو کەس خۆشتر ویستن و ئاوڕ لە قازانج یان ئاسایشی خەڵک نەدانەوە ‹سەرخۆشم و مەیخانەپەرستم بۆ چی؟/ هەر بۆیە کە خۆ لە خۆپەرستی لادەم «هەژار، *خەییام*»› 🇮🇷 خودپرستی

**خۆپەسن** / xopesin/: ☜ **خۆپەسند**

**خۆپەسند** / xopesind/: ئاوەڵناو. خۆپەسن؛ خۆپەسەن؛ خۆپەسێن؛ خۆبەزلزان؛ خۆبین؛ لەخۆبایی؛ کاو؛ بەفیز؛ بڤر؛ گەڤەزە؛ گەبەزە؛ بادیهەوا؛ بە خدە یان وازی هەر خۆ پێ باش بوون 🇮🇷 خودپسند

**خۆپەسندی** / xopesindî/: ناو. خۆپەسنی؛ گەڤەزەیی؛ قۆڕەدەماخی؛ بادیهەوایی؛ خدەی خۆ پەسند؛ خۆ باشتر لە دیتران زانین 🇮🇷 خودپسندی

**خۆپەسنی** / xopesinî/: ☜ **خۆپەسندی**

**خۆپەسەن** / xopesen/: ☜ **خۆپەسند**

**خۆپەسێن** / xopesên/: ☜ **خۆهەڵکێش**

**خۆپیشاندان** / xopîşandan/: ناو. دەرکەوتنی بە کۆمەڵ بۆ دەربڕینی بۆچوونی تاقمێک، بە کۆ بوونەوە یا ڕێ پێوان 🇮🇷 تظاهرات

**خۆپێگرتوو** / xopêgirtû/: ئاوەڵناو. متوون؛ متوو؛ هۆگر 🇮🇷 مأنوس

**خۆتاش** / xotaş/: ناو. خۆتراش؛ خودتەراش: ١. مەکینەی ڕیش تاشین ٢. ئامرازی قەڵەم دادان 🇮🇷 ١. ماشین ریش‌تراش ٢. مدادتراش

**خۆتراش** / xot(i)raş/: ☜ **خۆتاش**

**خۆترێن** / xot(i)řên/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی کارێ کە بە زەرەری خۆ بێ ‹شەڕی خۆترێن نەیکەی چاترە «مەسەل»› 🇮🇷 ویژگی کاری به زیان کننده‌اش باشد

**خۆتە** / xote/: ناو. بەچکە نەقە؛ جۆرێک ماسی 🇮🇷

نوعی ماهی

**خۆتەڕکەر / xoteřker/**: ئاوەڵناو. میزن؛ کوندەمێز ☰ شاشو

**خۆتەکە / xoteke/**: ناو. جۆرێ ماسی ☰ نوعی ماهی

**خۆتێهەڵقوتێن / xotêhełqutên/**: ئاوەڵناو. *[پلار]* خۆتێهەڵقۆتێن؛ خۆتێهەڵقورتێن؛ خۆتێهەڵقوڵتێن؛ خۆهەڵقوتێن؛ ڕدوک؛ دڕدۆک؛ هەڵقورتێن ☰ فضول

**خۆتێهەڵقوتێنی / xotêhełqutênî/**: ناو. *[پلار]* لابەلایی؛ لاوەلایی ☰ فضولی

**خۆتێهەڵقورتێن / xotêhełqurtên/**: ☚ **خۆتێهەڵقوتێن**

**خۆتێهەڵقوڵتێن / xotêhełqułtên/**: ☚ **خۆتێهەڵقوتێن**

**خۆتێهەڵقۆتێن / xotêhełqotên/**: ☚ **خۆتێهەڵقوتێن**

**خۆجوان / xoc(i)wan/**: ئاوەڵناو. جوان؛ جوانی سروشتی ☰ زیبای طبیعی

**خۆجە / xoce/**: ناو. نازناوێکی مەلایانە ☰ از القاب روحانیان

**خۆجەلی / xocelî/**: ناو. سپیندار؛ ئەسپیدار ☰ سپیدار

**خۆجێ / xocê/**: ئاوەڵناو. خۆجێیی؛ دانیشتووی قەدیمی لە گوند ☰ مُقیم

**خۆجێیی / xocêyî/**: ☚ **خۆجێ**

**خۆخ / xox/**: ناو. کۆخ؛ قۆخ؛ هەشتاڵوو؛ هڵوو ☰ هُلو

**خۆخلافکێ / xox(i)łafkê/**: ناو. سەرگەرمی؛ کازە؛ چالاکییەک بۆ ڕابواردن، خۆ خلافان و حەسانەوەی زەین ☰ سرگرمی

**خۆخوا / xox(i)wa/**: ئاوەڵناو. خۆبین؛ خۆپەسند ☰ خودخواه

**خۆخواز / xox(i)waz/**: ☚ **خۆپەرست**

**خۆخوازی / xox(i)wazî/**: ☚ **خۆپەرستی**

**خۆخولێ / xoxulê/**: ناو. شەولەبان؛ ئاشەگوێرێژ؛ منداڵترسێن ☰ لولو؛ بچەترسان

**خۆخوەر / xox(i)wer/**: ☚ **خۆخۆر**

**خۆخۆر / xoxor/**: ئاوەڵناو. ١. خەزاز؛ خۆخوەر ٢. *[مەجاز]* دژمنی گەل و قەومی خۆ «ئەگەرچی ئێمە قەومێکی زۆرین/ بەلام داخەکەم چەوت و خۆخۆرین «بێکەس»» ☰ ١. خودخور ٢. بیگانەپرست

**خۆخۆری / xoxorî/**: ناو. ١. خەزازی؛ دۆخی خەم و خەفەتی زۆر خواردن و نەدرکاندنی ٢. *[مەجاز]* کار و ڕەوتی دژمنایەتی کردن لەگەڵ گەل و قەومی خۆ ☰ ١. خودخوری ٢. بیگانەپرستی

**خۆخە / xoxe/**: ناو. هۆخ؛ درگای پچووک لە ناو دەروازەدا ☰ در ورودی کوچک در میان دروازه

**خۆدار / xodar/**: ☚ **خۆگرتوو-١**

**خۆداری / xodarî/**: ناو. خۆڕاگری؛ پشوو لە سەر خۆیی ☰ خودداری

**خۆدان / xodan/**: ناو. عارەق؛ خۆ؛ ئارەقەی لەش ☰ عَرَق

**خۆدەر / xoder/**: ☚ **خۆڕسک**

**خۆدی / xodî/**: ناو. ١. خودا؛ خوا؛ خوای ٢. خودان؛ خاوەن ☰ ١. خدا ٢. صاحب

⊡ **خۆدی کردن**: ١. خۆدی کرن؛ سەرپەرشتی کردن؛ خەمخۆری کردن ٢. بە ساحێب کردن ☰ ١. مُراقبت کردن ٢. مالک گرداندن

**خۆدی کرن**: ☚ **خودی کردن -١**

**خۆر[1] / xor/**: ناو. ١. خوەر؛ خۆ؛ هۆر؛ تاو؛ هەتاو؛ ڕۆ؛ وەر؛ وێرە؛ ڕۆژ؛ ڕۆژیار؛ ڕۆجیار؛ ڕۆچیار؛ تیرۆژک؛ تاف؛ هەتاف؛ هەڤەرە؛ ئافتاو؛ ئەفتەو؛ خوەرەتاو؛ ڕۆژی ئاسمان؛ ئەستێرەی کۆمەڵەی ڕۆژ کە لە ڕۆژانی بێهەور لە ئاسماندا دەدرەوشێ و سەرچاوەی ڕۆشنایی و تینی زەوییە ٢. ☚

**خۆل**[1] 🇮🇷 ١. خورشید ٢. ☜ **خۆل**[1]

⊡ **خـۆر کـەوتن/ دەرکـەوتـن/ کـەفتن/ هـەڵاتـن/ هەڵخستن/ هەڵدان** تاو هـەلاتن؛ ڕۆژ بوونـەوە 🇮🇷 طلوع کردن خورشید

**خۆر نیشتن** تاو ئاوا بوون 🇮🇷 غروب کردن خورشید

▪ **خۆر**[2]: پاشەوشە. بخۆر ‹نان‌خۆر؛ خوێنخۆر؛ گیـاخۆر› 🇮🇷 - خور؛ - خوار

**خۆرئاوا / xor'awa/:** ☜ **خۆراوا**

⊡ **خۆرئاوا بوون** ☜ **خۆراوا بوون**

**خۆرا / xora/:** ئاوەڵناو. زۆرخۆر؛ فرەخوەر 🇮🇷 بخـور؛ پُرخور

**خۆراک / xorak/:** ناو. ١. هەردە؛ خوارن؛ خـواردن؛ خواردەمەنی؛ خواردنی؛ واردەمەنی؛ خورد؛ واردە؛ ڕوەرە؛ خوار؛ چەرە؛ چێشت؛ ئەوەی بـۆ لابـردنی برسییەتی دەخورێت ‹ڕۆژی پڕ لە خۆراک بۆ گیـان و بۆ لەش/ ڕۆژی پڕ لە ئافرەت، پڕ لە باغچەی گـەش «گۆران»› ٢. *[کینایە]* پێخۆر؛ شێو؛ چێشتێ کە لێ نرابێ ‹... لە سەعات حەوتی ئێوارەوە تـا مـەیخانـە چـۆل دەبـێ، حیسـابی ئـارەق و خـۆراکی فرۆشـراو بنووسم ... «هەژار، چێشتی مجێور»› ٣. هێندێ لە دەرمان کە بە جارێک ئـەخورێ ٤. *[مەجاز]* پێـز؛ کالەدەند؛ ماکی سـەرەکی پێویسـت بـۆ گـەڕانی کارێک ‹ئەم هەودایە خۆراکی چوار مانگی کارخانەکە دابین دەکا› ٥. *[مەجاز]* ماکی پێویسـت بـۆ شـتێ ‹خۆراکی ئەم قۆرییە دوو پێوانەیە؛ تفەنگەکەم بیسـت فیشەک خۆراکییە› 🇮🇷 ١تا٥. خوراک

**خۆراکی / xorakî/:** نـاو. خواردەمەنی؛ واردەمـەنی؛ خۆرەک؛ خۆراک؛ خوەرداش؛ چشت‌مشـت؛ زای؛ خواردەمەنیگەلی جگە لـە پێخـۆری ڕۆژانـە کـە زیاتر بۆ چێژ وەرگرتن دەخورێت (وەک: شیرینی، چەرەز، میوە، چلوورە و...) 🇮🇷 خوراکی

**خۆراندن / xorandin/:** چاوگ. خۆرانن؛ پەژقانـدن؛ دەرخوارد دان 🇮🇷 خورانیدن

**خۆرانگاز / xorangaz/:** ☜ **خۆرەنگاز**

**خۆرانگـازی / xorangazî/:** نـاو. تـاوبردوویی؛ تاوانگازی؛ ڕەوتی هەتاو بردن 🇮🇷 آفتابزدگی

**خۆرانن / xoranin/:** ☜ **خۆراندن**

**خۆراوا / xorawa/:** ناو. خوەراوا؛ خۆرئاوا؛ ڕۆژاوا: ١. ڕۆژپەڕ؛ دەمی ڕۆژ ئاوا بوون؛ تەنگی نوێژی شێوان ٢. خۆرنشین؛ وڵاتی ڕۆژاوایی 🇮🇷 ١. مغرب ٢. غرب

⊡ **خۆراوا بوون** خوەراوا بـوون؛ خۆرئـاوا بـوون: ١. ڕۆژ پەڕین؛ خوەر نیشتن ٢. *[کینایە]* دێر بـوون؛ کات لە دەست چوون ‹کوڕە خۆر ئاوا بوو بۆ هەر دانیشتووی؟ بۆ ناچی؟› 🇮🇷 ١. غروب کردن آفتـاب ٢. دیر شدن

**خۆراوایی / xorawayî/:** ئاوەڵـناو. ڕۆژاوایی؛ خەڵکی وڵاتی ڕۆژاوایی 🇮🇷 اهل مغرب زمین؛ غربی

**خۆراوی / xorawî/:** ئاوەڵـناو. تـۆزاوی؛ خـۆڵاوی 🇮🇷 خاک‌آلود

**خۆربردوو / xorbirdû/:** ئاوەڵناو. تاوانگاز؛ ڕۆژگەز 🇮🇷 آفتاب‌سوخته

**خۆرپەرست / xorperist/:** نـاو. تێرتێـرە؛ قومقومـە؛ زەردەقۆرە؛ جۆرێ مارمێلکەی ئەستوور و درێـژە، زۆر زوو ڕەنگـی خـۆی دەگـۆڕێ و بـە ڕەنگـی دەوروبەری دەردێ 🇮🇷 آفتاب‌پرست

**خۆرت / xort/:** ناو. لاو؛ جحێڵ؛ گەنج 🇮🇷 جوان

**خۆرتئاسایی / xort'asayî/:** ئاوەڵکار. لاوانـە؛ وەک جحێلان 🇮🇷 جوانانه

**خۆرتـانی / xortanî/:** نـاو. تـافی جـوانی؛ لاوەتی؛ ڕۆژگاری گەنجی 🇮🇷 عنفوان جوانی

**خۆرتی / xortî/:** نـاو. گەنجایەتی؛ گـەنجی؛ لاوانی 🇮🇷 جوانی

**خۆرج / xorc/:** ☜ **خورجێن**

**خۆرزەدە / xorzede/:** ئاوەڵناو. تاوانگـاز؛ تـاوبردە 🇮🇷 آفتابزده

**خۆرست / xorist/:** ☜ **خۆرسک**

**خۆرش / xoriş/:** ☜ **خۆرشت**

**خۆرشت / xorişt/:** ناو. خۆرش؛ خوەرشت؛ پێخۆری کولاو ☰ خورشت

**خۆرک / xorik/:** ناو. کورمووری؛ ژەنگ؛ خۆسەرە ☰ زنگ فلزات

**خۆرکە / xorke/:** ناو. مۆریانە ☰ موریانە

**خۆرکەزەردە / xorkezerde/:** ناو. زەردەپەڕ ☰ زردی آفتاب هنگام غروب

**خۆرماشارەکێ / xormaşarekî/:** ناو. چاوشارەکێ؛ چاوشارکێ ☰ قایم‌موشک

**خۆرنشین / xorn(i)şîn/:** ناو. ڕۆژاوا؛ خۆراوا ☰ باختر؛ مغرب

**خۆرنەگەز / xornegez/:** ناو. نسار؛ نزار ☰ سایەسار

**خۆروەزان / xorwezan/:** ناو. ۱. بەر ڕۆژ؛ بەڕۆژ؛ بەرۆچکە ۲. ڕۆژهەڵات ☰ ۱. آفتابگیر ۲. مشرق

**خۆرە[1] / xore/:** ناو. خوەرە؛ خیرک؛ گولی؛ پیسی؛ گولپیس؛ ئاکلە؛ شەقافلووس؛ نەخۆشییەکی زۆر خراپ و پیسە، ئەندامانی لەش (بەتایبەت سەر و چاو و دەست و پێ) زام دێنن و لێیان دەبێتەوە ☰ خورە؛ جُذام

▪ **خۆرە[2]:** پاشەوشە. ۱. ـ خۆر ‹نانخۆرە مشوور خۆرە› ۲. ئامرازی خواردن/ خواردنەوە ‹ناوخۆرە› ☰ ۱. ـ خور ۲. ـ خوری

**خۆرەتاو / xoretaw/:** ناو. خوەرەتاو: ۱. هەتاو؛ تیشکی ڕۆژێ ۲. ئەو لایە لە کەژ کە خۆر زۆرتر دەیگرێ ☰ ۱. آفتاب ۲. آفتابگیر

**خۆرەزەرد / xorezerd/:** ناو. زەردەپەڕ؛ خۆرەزەردکە ☰ هنگام غروب

**خۆرەزەردکە / xorezerdke/:** ☜ **خۆرەزەرد**

**خۆرەک / xorek/:** ناو. خواردنی؛ خۆراک ☰ خوردنی

**خۆرەڵات / xoreɫat/:** ☜ **خۆرهەڵات**

**خۆرەن / xoren/:** ناوەڵناو. خواردەمەنی؛ شیاوی خواردن ☰ خوردنی

**خۆرەنگاز / xorengaz/:** ناوەڵناو. خۆرانگاز؛ تاوانگاز؛ تاوبردوو. هەروەها: **خۆرەنگازی** ☰ آفتابزدە

**خۆرەوتاو / xorewtaw/:** ناو. هورەتۆو؛ بەربەرۆچکە ☰ آفتابگیر

▪ **خۆرەوە / xorewe-/:** پاشەوشە. ۱. ـ نۆش؛ فڕکەر ‹مەی خۆرەوە› ۲. لە خۆ هەڵگر ‹ڕق خۆرەوە قین خۆرەوە› ☰ ۱. ـ نوش ۲. فروخورندە

**خۆرهەڵات / xorheɫat/:** ناو. خۆرەڵات؛ ڕۆژهەڵات؛ هۆرامان؛ خاوەر ☰ مشرق؛ خاور

**خۆری / xorî/:** ☜ **خوێری**

**خۆڕا / xořa/:** ناوەڵناو. لاسار؛ گوێ‌نەبیس ☰ لجباز

**خۆڕاگر / xořagir/:** ناوەڵناو. ۱. خوددار؛ پشوودرێژ ‹خاتوونێکی یەکجار خۆڕاگرە، بەو هەموو ئێش و ئازارەوە گلەیەک ناکا› ۲. بەرگەگر؛ باشارکەر ‹ئەم ڕەنگە لە بەر تاو خۆڕاگر نییە، کاڵ دەبێتەوە› ۳. گورێخ؛ بەدەوام؛ ڕاوەستاو ‹ئەم ماڵە خۆڕاگرە و بەم زوانە نارمێ› ☰ ۱. خویشتندار ۲. مقاوم ۳. استوار

**خۆڕاگری / xořag(i)rî/:** ناو. ۱. لەسەرخۆیی ۲. باشار؛ بەرگەگری ☰ ۱. خویشتنداری ۲. مقاومت

**خۆڕایی / xořayî/:** ناوەڵناو. خوێڕایی: ۱. لاسار و سەرسەخت ‹کابرایەکی کەللەشەق و خۆڕایی بۆتە وەزیر› ۲. بەلاش؛ بێ‌نرخ ‹دەکێشن زەحمەت و ناخۆن وەکوو وان نانی خۆڕایی/ دەکەن کار و دەڕێژن ئارەق و نازین بە ڕیسوایی «هێمن»› ۳. بێخۆ؛ بێ‌سوود؛ فیڕۆ؛ بە هیچێ ‹نەفەس بگرە لە هاتوچوویی خۆڕایی هەتا ماوی/ کە ئەم بایە هەتا ئێستاکە هەر عومری بە با داوی «نالی»› ٤. بێهۆ؛ لە هیچێ ‹ خۆڕایی نییە ناڵەیی گەرمم، دەمی سەردم/ هەڵبەت بە بەلایێکەوە ئالاوە دڵی من «بێخود»› ٥. وێڵ؛ بەرەڵڵا ☰ ۱. خودسر ۲. مُفت ۳. هدررفتە ۴. بیهودە ۵. وِل

⊡ **خۆڕایی کردن** بەرەڵڵا کردن؛ بەرهەڵدا کردنی ڕانی ئاژەڵ و ماڵات ☰ یلە کردن دام

**خۆڕست / xořist/:** ☜ **خۆڕسك**

**خۆڕستی / xořistî/:** ناو. هەڵەسوون؛ گیای پاش دروون سەرهەڵداو ☰ گیاه بعد از درو سبز شده

**خۆڕسک / xořisk/:** ئاوەڵناو. خۆرست؛ خۆدەر؛ خۆوەر؛ خواکرد؛ خودری؛ خۆزا؛ خۆنیا؛ بە تایبەتمەندی ڕوانی خۆبەخۆیی، بێ ئەوەی کەسێک چاندبێتی ☰ خودرو

**خۆڕسکاو / xořiskaw/:** ئاوەڵناو. سروشتی؛ خۆکرد ☰ خودرو

**خۆڕم / xořim/:** ناو. شەغرە؛ بارە گیایەکی پەستواو ☰ بسته گیاه بار یک باربر

**خۆڕوو / xořû/:** ئاوەڵناو. بێخەوش؛ ڕەنگ پاقژ و بێزەدە ☰ صاف؛ خالص

**خۆڕەنگ[1] / xořeng/:** ناو. ١. ڕەنگی سروشتی ٢. ڕەنگێ کە کاڵ نابێتەوە ☰ ١. رنگ طبیعی ٢. رنگ ثابت

**خۆڕەنگ[2]:** ئاوەڵناو. ١. خاسەڕەنگ؛ تایبەتمەندی ڕەنگێ کە سروشتییە ٢. *[کینایە]* تایبەتمەندی کەسێ کە تەنیا خزم و کەسی خۆی دەناسێ و بایەخ بە کەسانی‌تر نادا ☰ ١. خودرنگ ٢. دارای تنها متوجه اطرافیان خود و بی اعتنا به دیگران

**خۆڕی / xořî/:** ☜ **خوڕی**

**خۆڕیوتۆڕی / xořî w tořî/:** ئاوەڵناو. *[پەلار]* **عەلۆـجەلۆ؛ گەجەر ـ گوجەر** ☰ اوباش؛ رجاله

**خۆڕێخەر / xořêxer/:** ئاوەڵناو. ١. تایبەتمەندی کەس یان شتێک کە سەربەخۆ کار دەکا ٢. *[کینایە]* خۆڕێکخەر؛ تایبەتمەندی کەسێ کە بە خۆ شیرین کردن کاری خۆی بەڕێوە دەبا ☰ ١. خودکار ٢. خودشیرین

**خۆڕێکخەر / xořêkxer/:** ئاوەڵناو. ١. خۆمرێس؛ بە تایبەتمەندی ڕێکوپێک بوون بە شێوەی سەربەخۆ ٢. ☜ **خۆڕێخەر ـ ٢** ٣. سازشکار؛ خووگرتوو بە سازان بۆ دوور کەوتنەوە لە دەردیسەر ‹باوکی عەجیب خۆڕێکخەر بوو، لەگەڵ هەموو کەسێکدا ئەسازا› ☰ ١. خودسامان ٢. ☜ **خۆڕێخەر ـ ٢** ٣. سازشکار

**خۆز / xoz/:** ناو. ١. قۆزاخەی پەمۆ ٢. هەر بەرێ کە قۆزاخەیی بێ (وەک: سنەوبەر و...) ☰ ١. غوزەی پنبە ٢. هر ثمری که غوزه داشته باشد

**خۆزا / xoza/:** ☜ **خۆڕسك**

**خۆزکا / xozka/:** ☜ **خۆزگە**

**خۆزگا / xozga/:** ☜ **خۆزگە**

**خۆزگاری / xozgarî/:** ☜ **خۆزگە**

**خۆزگایا / xozgaya/:** ☜ **خۆزگە**

**خۆزگایەکوو / xozgayekû/:** ☜ **خۆزگە**

**خۆزگایێ / xozgayê/:** ☜ **خۆزگە**

**خۆزگە / xozge/:** سارستە. خۆزگا؛ خۆزیا؛ خۆزکا؛ خۆزگایا؛ خۆزگایێ؛ خۆزیایا؛ خۆزیایێ؛ خۆزگاری؛ خووزیا؛ خۆزەو؛ خۆزی؛ خوەزگە؛ خوەزیا؛ خۆزگایەکوو؛ خوزگە؛ خوەزگ؛ خوەزی؛ خۆزێ؛ خۆزە؛ خوزەو؛ خوەزێو؛ خوەزگە؛ خوەزوو؛ بەزە؛ بەزەو؛ بزێ؛ بریا؛ بری؛ بریکەنێ؛ بریکا؛ های؛ شەلا؛ شەلای؛ وەشلەی؛ یاش؛ یاشا؛ کاش؛ کاشکا؛ کاشکای؛ کاشکایە؛ کاشکایەکوو؛ کاشکایەکی؛ کاشکان؛ کاشک؛ کاشکی؛ ئار؛ ئاخ؛ غەزگاڵ؛ تەیسا؛ تەووسا؛ تۆەسیا؛ وشەیەک بۆ دەربڕینی ئاوات و داخوازی دڵ ‹خۆزگە وەک خۆر نەمدیبایە شەوی تار/ خۆزگە دەمێ ڕامنەبواردبایە بێ یار// خۆزگە پیری کەلەلای نەدەکردم/ خۆزگە لە یەکەم ژوانگەدا دەمردم «هێمن»› ☰ ای کاش

▣ **خۆزگە بە خۆم/ خۆت** ...: خۆشی لە خۆم/ خۆت ...؛ خۆش بە دیارم/ دیارت... ‹هەی خۆزگە بە خۆم کە ناوم نابەن/ لە مزگەوتانا غەیبەتم ناکەن! «قانع»› ☰ خوش به حالم/ حالت ...

▣ **خۆزگە بردن:** خۆزگە خواستن/ خواردن؛ ئارەزوو کردن؛ ئاوات خواستن ☰ آرزو کردن

**خۆزگە خواستن/ خواردن:** ☜ **خۆزگە بردن**

**خۆزگە خواستن:** ☜ **خۆزگە بردن**

**خۆزە** / xoze/: ☜ **خۆزگە**

**خۆزەو** / xozew/: ☜ **خۆزگە**

**خۆزی** / xozî/: ☜ **خۆزگە**

**خۆزیا** / xozya/: ☜ **خۆزگە**

**خۆزیایا** / xozyaya/: ☜ **خۆزگە**

**خۆزیایێ** / xozyayê/: ☜ **خۆزگە**

**خۆزێ** / xozê/: ☜ **خۆزگە**

**خۆژی** / xojî/: ئاوەڵناو. خۆژیو؛ بژێک؛ بژیو؛ بێنیاز بە کەس ▆ خودکفا

**خۆژیو** / xojîw/: ☜ **خۆژی**

**خۆژیوی** / xojîwî/: ناو. دۆخی بێنیاز بوون لە کەس ▆ خودکفایی

**خۆس** / xos/: ناو. شووسەوە؛ شووڵی سەبە چنین ▆ ترکەی سبدبافی

**خۆسار** / xosar/: ناو. سەرماوەز؛ سیخوار؛ ئازەر ▆ آذر ماه

**خۆسپ** / xosp/: ناو. غەیبەت؛ پاشەملە؛ پاشملە ▆ غیبت

**خۆستۆخ** / xostox/: ئاوەڵناو. داواکەر؛ خوازەڵۆک ▆ آزمند

**خۆستی** / xostî/: ناو. داواکاری لە کچ یان بێوەژن بۆ ژیانی هاوبەشی ▆ خواستگاری

**خۆسسی** / xossî/: ☜ **خەسو**

**خۆسن** / xosin/: ☜ **خوسن**

**خۆسەر** / xoser/: ئاوەڵناو. خودسەر؛ لاسار ▆ خودسر

**خۆسەرە** / xosere/: ناو. کورمووری؛ ژەنگ؛ خۆرک ▆ زنگ فلزات

**خۆسەری** / xoserî/: ناو. خودسەری؛ لاساری؛ چۆنیەتی بە ئارەزووی خۆ کار کردن ▆ خودسری

**خۆش**[1] / xoş/: ئاوەڵناو. خوەش؛ وەش: ١. بەتام ‹وەختە بڵێم [پلە] منی بە قەد تاقانەکەی خۆی خۆش دەویست. هەر چێشتێکی خۆشی لێنابا، دەیناردە دوام «هەژار، چێشتی مجێور» ٢. دڵگیر ‹شوێنێکی خۆشە› ٣. ساق و سلامەت ‹حاڵی خۆش› ٤. بەدەماخ ‹وەستاوم سا دڵم خۆش کە/ شیعری پێشووم فەرامۆش کە «گۆران»› ٥. شاد؛ دڵپەسەند ‹قسەی خۆش لە ناو نەخۆشان زۆر بوو، کەمم لە بیر ماون «هەژار، چێشتی مجێور»› ٦. لەبەردڵان ‹بۆنی خۆش› ▆ ١. خوشمزه ٢. دلپسند ٣. سلامت ۴. خوش ۵. شاد ۶. مطبوع

◘ **خۆش بوران:** خۆش ڕابواردن؛ کەیف کردن ▆ خوش گذراندن

**خۆش بوون:** ١. شیاوی خواردن بوون ‹میوە خۆش بووە› ٢. بەتام بوون ‹چێشتەکە خۆش بووە› ٣. خۆشە/ خوەشە بوون؛ ئامادە بوونی چەرم و ... بۆ دە کار کردن ٤. شیاوی سواغ بوونی قوڕ ٥. بەرز و بەگڕ بوونی ئاگر ‹باران دەباری و ئاگر سووک و هاسان خۆش نەدەبوو› ٦. سلامەت بوون ‹تاقانەیە تیمی خەلەفی ئاخری نیسان!/ تۆ خۆش بی، سەدەف بوو بە فیدات، دوور بی لە ئافات «نالی»› ٧. بەخشین؛ لێ بووردن ‹لە خۆم و لەو کەسە خۆشم دەوێت و خۆشی دەوێم/ خودایە خۆش ببی و تۆ ببی خودایا خۆش «مەحوی»› ٨. خۆشحاڵ بوون؛ شاد بوون ‹لە خۆم و لەو کەسە خۆشم دەوێت و خۆشی دەوێم/ خودایە خۆش ببی و تۆ ببی خودایا خۆش «مەحوی»› ▆ ١. قابل خوردن بودن ٢. خوشمزە بودن ٣. آمادە شدن چرم برای استفادە ۴. سرشتە شدن کاهگل ۵. گُر گرفتن آتش ۶. سالم بوودن ٧. بخشیدن ٨. خوشحال شدن

**خۆش بون لە کەسێک:** لێخۆش بوون؛ بەخشینی کەسێک ‹تۆ بی هەموو جیلوەی جوانیت:/ لێمخۆش بە! دڵم ڕەنجانیت «گۆران»› ▆ کسی را

بخشیدن

**خۆش بونەوە** ۱. چاک بوونەوە؛ هەستانەوە لە نەخۆشی ۲. چاک بوونەوەی زام ۳. ئاشت بوونەوە ☰ ۱. شفا یافتن ۲. التیام یافتن ۳. آشتی کردن

**خۆش کردن/ کرن** ۱. بەرز کردنەوەی گڕی ئاگر ‹ئاگرەکە کز بووە، خۆشی کە!› ۲. خۆشە/ خوەشە کردن؛ ئامادە کردنی پێست بۆ دە کارکردن ۳. خۆشە/ خوەشە کردن؛ تامی تاڵ نەهێشتن ٤. خۆشە کردن؛ باش شێلانی قوڕ بە سەر یەکدا ٥. خۆش کردنەوە؛ خوەشەو کردن؛ وەستانەوەی باران و بەفر ‹هەوا خۆشی کرد با بچین!› ٦. گوشاد و تازە کردنەوەی ماڵ ۷. باش کێلانی زەوی ۸. تەخت کردنی شوێنی نالەبار ۹. توندتر هەڵکردنی با ۱۰. باش/ خاس کردن ☰ ۱. آتش را جان دادن ۲. پوست را قابل استفاده کردن ۳. تلخ را شیرین کردن ۴. گل را خوب سرشتن ۵. بند آمدن بارش ۶. مرمّت کردن مسکن ۷. خوب شخم زدن زمین ۸. صاف کردن زمین ناهموار ۹. تندتر وزیدن باد ۱۰. درست کردن

**خۆش کردنەوە** ۱. وەستانەوەی بەفر و باران ۲. ئاشت کردنەوە ☰ ۱. بند آمدن بارندگی ۲. آشتی کردن

**خۆش گەرەک بون** ☜ **خۆش ویستن**

**خۆش لێهاتن** خۆش ویستن ☰ دوست داشتن

**خۆش ویستن** حەباندن؛ خۆش گەرەک بوون؛ بەر دڵ کەوتن ‹لە خۆم و لەو کەسە خۆشم دەوێت و خۆشی دەوێم/ خودایە خۆش ببی و تۆ ببی خودایا خۆش «مەحوی»› ☰ دوست داشتن

**خۆش هاتن** خۆشاتن: ۱. خۆش بوون؛ بە دڵ بوون؛ پەسند بوون؛ حەز لێ بوون ‹دڵ بۆیە خۆشی دێ لە نەخۆشی بە پڕبەدڵ/ بیمارە چاوی یار و خۆشی دێ لە دەردودا «مەحوی»› ۲. بە خێر هاتن؛ هۆی خۆشحاڵ بوون؛ بوونە هۆی گەشانەوە ☰ ۱و۲. خوش آمدن

**خۆشەو بون** چا بوونەوە؛ لە نەخۆشی هەستانەوە ☰ شفا یافتن

**خۆشەو کردن** خۆشەوە کردن: ۱. چا کردنەوەی نەخۆش یان برین ۲. تۆڵە و قەرەبووی خراپە کردنەوە ☰ ۱. شفا بخشیدن ۲. قصاص کردن

**خۆشەوە کردن** ☜ **خۆشەو کردن**

**پێ خۆش بون** حەز لێ هاتن؛ حەز پێ کردن ‹گەردەنم پێ خۆشە حەڵقەی تای تەنافی زولفەکەت/ چاوەکەم ئیتر حەوالەی تەوق و زۆلانەی مەکە! «ئەدیبی زەندی»› ☰ خوش داشتن

**لێ خۆش بون** لێ بووردن؛ بەخشین ‹تا کتێبەکانم نەدەیتەوە لێت خۆش نابم› ☰ بخشیدن

**خۆش**[2]: ئاوەڵکار. خوەش: ۱. بەپەلە؛ ئازا؛ زوو ‹خۆش ئەڕوا› ۲. چاک؛ باش ‹تۆ خۆش دەبەزی ئەسپی بەزینت پێیە/ من ناگەمە تۆ ئەسپی بەزینم پێیە! «حاجی قادر»› ۳. لەبار ‹خۆش کار ئەکا؛ خۆش دەنووسێ› ☰ ۱. سریع؛ تند ۲. خوب ۳. مُناسب

**خۆش**[3]: سارستە. خوەش؛ خۆش بێ؛ سلامەت بێ ‹سەرخۆشی شەرابی دەمی تۆ بووم و ئەمێستاش/ قوربان سەری تۆ خۆش کە نەماوە سەری خۆشم «نالی»› ☰ سلامت باد

**خۆش**[4] ـ: پێشوشە. خوەش ـ: چاک ‹خۆشڕەوت؛ خۆشبەز؛ خۆشدەماخ؛ خۆشناو› ☰ خوش ـ

ـ **خۆش**[5]: پاشەوشە. خوەش: ۱. شاد ‹دڵخۆش› ۲. وە بەر دڵ ‹قسەخۆش› ۳. لەبار ‹باوخۆش› ٤. خۆشەویست ‹خەوخۆش› ☰ ۱. ـ خوش ۲و۳. خوش ـ ۴. ـ دوست

**خۆش‌ئاژۆ / xoş'ajo/**: ئاوەڵناو. خۆشاژۆ: ١. تیژڕۆ ٢. خۆش‌ڕکێف ‹سارەوانانی تەمەن خۆش‌ئاژۆن/ بێ‌وچان دەیدەنە بەر تازە و کۆن «هەژار»› ☰ ١. تیزرو ٢. خوش‌رکاب

**خۆش‌ئاواز / xoş'awaz/**: ئاوەڵناو. دەنگ‌خۆش ☰ خوش‌آواز

**خۆشا / xoşa/**: سارستە. خۆزگە بە ☰ خوشا

**خۆشاب / xoşab/**: ☜ **خۆشاو**

**خۆشارکێ / xoşarkê/**: ☜ **خۆشارۆکێ**

**خۆشارۆکی / xoşarokî/**: ☜ **خۆشارۆکێ**

**خۆشارۆکێ / xoşarokê/**: ناو. خۆشارکێ؛ خۆشارۆکی؛ چاوشارکێ ☰ قایم‌باشک

**خۆشاژۆ / xoşajo/**: ☜ **خۆش‌ئاژۆ**

**خۆشامایی / xoşamayî/**: ناو. دوورەنگی؛ دووڕوویی ☰ ریا

▣ **خۆشامایی کردن**: ڕیایی کردن؛ ماستاو کردن ☰ تملق کردن

**خۆشاو / xoşaw/**: ناو. خۆشاب؛ خوەشاو؛ مێوژ و قەیسی و ... وشکی خووساو ☰ میوەی خشک خیسانده در آب

**خۆشاواز / xoşawaz/**: ئاوەڵناو. خۆش‌بێژ؛ دەنگ‌خۆش ☰ خوش‌آواز

**خۆشباو / xoşbaw/**: ئاوەڵناو. باوخۆش؛ هەڵ‌خۆش ☰ خوش‌دست

**خۆشباوەڕ / xoşbawer̄/**: ئاوەڵناو. ساویلکە؛ دڵ‌ساف؛ بێ‌فێڵ‌وفەرەج. هەروەها: **خۆشباوەڕی** ☰ خوشباور

**خۆشبژێو / xoşb(i)jîw/**: ئاوەڵناو. پڕوپۆشتە؛ کۆک؛ ساز و تەیار ☰ مُرفه

**خۆشبەخت / xoşbext/**: ئاوەڵناو. بەختەوەر؛ بەختیار ☰ خوشبخت

**خۆشبەختانە / xoşbextane/**: ئاوەڵکار. بەختەوەرانە؛ وەشبەختانە؛ وشەیەکە بۆ پیشاندانی چاکی ڕووداوێک دەگوترێ ‹خۆشبەختانە ئەوساڵ داهاتی گەنم چاک بوو› ☰ خوشبختانه

**خۆشبەختی / xoşbextî/**: ناو. وەشبەختی؛ بەختەوەری؛ دۆخی هەبوونی ژیانی دڵخواز و پڕخۆشی ‹ماڵ و سامانی بەتەنیا، خۆشبەختی ناهێنێ› ☰ خوشبختی

**خۆشبەز / xoşbez/**: ئاوەڵناو. تیژڕەو؛ کرژ؛ گورج و گۆل؛ چوست و چەلەنگ؛ خێرا لە ڕۆیشتندا ☰ رهوار

**خۆشبین / xoşbîn/**: ئاوەڵناو. گەشبین؛ دوور لە ناهومێدی ☰ خوشبین

**خۆشبینی / xoşbînî/**: ناو. گەشبینی؛ وەشوینی: ١. باوەڕ بە چاک بوونی دیاردە، ڕووداو یان کەسێک ٢. باوەڕ بە چاک بوونی ڕووداوەکان و لە گەشە بوونی جەهان و هیوا بە داهاتوو ‹خۆشبینی بە داهاتوو لە باوەڕ بە مرۆڤایەتی و تواناییەکانی سەرچاوە دەگرێ› ☰ ١و٢. خوشبینی

**خۆش‌بێژ / xoşbêj/**: ☜ **خۆشاواز**

**خۆش‌پۆش / xoşpoş/**: ئاوەڵناو. تەڕپۆش؛ بۆشناغ؛ تەڕەنداز ☰ شیک‌پوش

**خۆشتام / xoştam/**: ئاوەڵناو. بەتام؛ خۆش‌چێژ؛ خاوەن تامی خۆش ☰ خوشمزه

**خۆشتەوی / xoştewî/**: ☜ **خۆشەویست**[1]

**خۆش‌جنس / xoşcins/**: ئاوەڵناو. بە چۆنیەتی باش و لەبارەوە؛ باش و بێ دەغەڵ ☰ خوش‌جنس

**خۆش‌چێژ / xoşçêj/**: ئاوەڵناو. خۆش‌چێژە؛ بەلەزەت؛ خۆشتام؛ خۆش‌تام ☰ لذیذ

**خۆش‌چێژە / xoşçêje/**: ☜ **خۆش‌چێژ**

**خۆشحاڵ / xoşĥał/**: ئاوەڵناو. کەیفخۆش؛ بەکەیف ☰ خوشحال

**خۆشخانە / xoşxane/**: ناو. خۆشەخانە؛ دەباغ‌خانە؛ هەلاڵ‌خانە؛ ئەو شوێنەی چەرمی تێدا خۆشە

دەکەن ☰ کارگاه دباغی

**خۆشخوان** / xoşx(i)wan/: ناوەڵناو. دەنگ‌بێژ؛ خۆش‌بێژ؛ دەنگ‌خۆش لە گۆرانی وتندا ☰ خوش‌آواز

**خۆشخوێ** / xoşx(i)wê/: ناوەڵناو. خوەش‌خوێ؛ خوەش‌خوا؛ وەش‌مەک؛ بە سوێری دڵخوازەوە ☰ خوش‌نمک

**خۆشخۆر** / xoşxor/: ناوەڵناو. خۆش‌خۆراک: ١. خوازیاری خواردەمەنی خۆش و بە سەلیقە لە هەڵبژاردنیاندا ٢. [کنایە] بخۆر؛ خۆرا؛ زۆرخۆر ☰ ١. خوش‌خوراک ٢. پُرخور؛ بخور

**خۆشخۆراک** / xoşxorak/: ناوەڵناو. ١. ☜ **خۆشخۆر** ٢. تام‌خۆش و لەبار بۆ خواردن ٣. شیاو بۆ دروست کردنی پێخۆری چاک ‹ئەم برینجە زۆر خۆش‌خۆراکە› ☰ ١. ☜ **خۆشخۆر** ٢و٣. خوش‌خوراک

**خۆش ـ خۆش**[1] / xoş xoş/: ناوەڵناو. ١. چەند خواردن یان خواردنەوەی خۆشتام و بەلەزەت ‹خۆراکی خۆش ـ خۆشی بۆ ساز دەکردین› ٢. چەند شتی شاد و دڵخۆشکەر ‹قسەی خۆش ـ خۆشی بۆ دەکردین› ☰ ١. چند خوراک خوشمزه ٢. چند چیز شاد و دلنشین

**خۆش ـ خۆش**[2]: ناوەڵکار. ١. پەلەپەل؛ بلەز ‹رۆژ و شەو خۆش ـ خۆش لە باتی کا گەلای پێدا دەکەن / وەک گەڵارێزانی پاییز یەک یەکی دەرژێنە ناو «نالی»› ٢. زۆر بەتامەوە؛ زۆر بە چێژەوە ‹خۆش ـ خۆش دەخوا› ٣. زۆر بەهیوا ‹خۆش ـ خۆش هاتم کوتم لەگەڵ خۆمیان دەبەمەوە› ☰ ١. باعجله ٢. با لذت ٣. امیدوارانه

**خۆشخوو** / xoşxû/: ناوەڵناو. ئاکارباش؛ خدەپەسند؛ دژی بەدخوو ☰ خوش‌اخلاق؛ خوشخو

**خۆشخەبەر** / xoşxeber/: ☜ **خۆشخەوەر**

**خۆشخەوەر** / xoşxewer/: ناوەڵناو. خۆش‌خەبەر؛ مژدەدەر؛ مژدەهێن؛ بەمزگێنی ☰ خوش‌خبر

**خۆشخەیاڵ** / xoşxeyał/: ناوەڵناو. خاوەن گەشبینی لەرادەبەدەر و نابەجێ ‹بۆ هێندە خۆشخەیاڵی، دۆستیی گورگ و بەرخ؟!› ☰ خوش‌خیال

**خۆشخیم** / xoşxîm/: ناوەڵناو. خۆش‌هیم؛ بێ‌شوێنەواری خراپ و مەترسیدار ‹نەخۆشی خۆش‌خیم› ☰ خوش‌خیم

**خۆشداکەنە** / xoşdakene/: ناوەڵناو. ١. [کنایە، شوورەیی] تایبەتمەندی ژنێ کە زوو خۆی بە دەستەوە دەدا ٢. تایبەتمەندی میوەیێ کە بە ئاسانی پاک دەکرێ (وەک نارنگی) ☰ ١. خصوصیت زنی که زود تمکین می‌کند ٢. ویژگی میوه‌ای که آسان پاک می‌شود

**خۆشدڕ** / xoşdiř/: ناوەڵناو. [کنایە] تەرپۆش؛ تەڕەنداز ☰ شیک‌پوش

**خۆشدەس** / xoşdes/: ☜ **خۆشدەست**

**خۆشدەست** / xoşdest/: ناوەڵناو. خوەشدەس؛ بە دۆخ یان چۆنیەتییەکی واوە کە بە هاسانی لە دەستدا بخونجێ و بە کار بچێ ‹هەرەی خۆشدەست› ☰ خوش‌دست

**خۆشدەڤ** / xoşdev/: ناوەڵناو. راوێژشیرین؛ قسەخۆش ☰ خوش‌صحبت

**خۆشدەماخ** / xoşdemax/: ناوەڵناو. کەیف‌ساز؛ دڵشاد ☰ سرحال؛ خوشحال

**خۆشدیمەن** / xoşdîmen/: ناوەڵناو. بەرجەوەندار ☰ خوش‌منظر

**خۆشڕابوێر** / xoşřab(i)wêr/: ناوەڵناو. دڵ‌چەرێن ☰ خوشگذران

**خۆشڕابوێری** / xoşřab(i)wêrî/: ناو. تووک‌ڕوونی ☰ خوشگذرانی

**خۆشڕاوێژ** / xoşřawêj/: ناوەڵناو. بەدەم‌ودوو؛ قسەڕەنگین ☰ سُخندان

**خـۆش‌ڕسـت** / xoşřist/: ئاوه‌ڵـناو. تایبه‌تمه‌نـدی تانجییه‌ک که بۆ ڕست کـردن ڕام و ده‌سـته‌مۆیه ☚ خصوصیت تازی شکاری کاملاً رام شده

**خۆش‌ڕکێف** / xoşř(i)kêf/: ☜ **خۆش‌زه‌نگو**

**خۆشڕۆ** / xoşřo/: ئاوه‌ڵناو. خۆشـڕه‌و: ۱. لـه ڕه‌وتـا به‌کار ۲. فێـری ڕه‌وتی په‌سـندکراو ☚ ۱. بادپا ۲. آزموده در درست راه رفتن

**خۆشڕوو** / xoşřû/: ئاوه‌ڵـناو. ڕووخـۆش؛ ڕووگوشـاد؛ دژی مڕ و مووچ ☚ بشّاش

**خـۆش‌ڕه‌فتـار** / xoşřeftar/: ئاوه‌ڵـناو. ئاکاربـاش؛ ئاکارچاک؛ به‌ئاکار ☚ خوش‌رفتار

**خۆشڕه‌و** / xoşřew/: ☜ **خۆشڕۆ**

**خـۆش‌زوان** / xoşz(i)wan/: ئاوه‌ڵـناو. خـۆش‌زوبـان؛ قسه‌خۆش؛ شیرین‌زمـان؛ زمـان‌خـۆش؛ خـاوه‌ن وتاری خۆش و دڵڕفێن و پاراو ☚ شیرین‌زبان

**خۆش‌زوبان** / xoşzuban/: ☜ **خۆش‌زوان**

**خۆش‌زه‌نگو** / xoşzengû/: ئاوه‌ڵناو. خۆش‌ڕکێف؛ به تایبه‌تمه‌ندی یان توانـایی چـاک سـواری دانـه‌وه ‹ئه‌سپی خۆش‌زه‌نگوو› ☚ خوش‌رکاب

**خۆش‌سه‌لیقه** / xoşselîqe/: ئاوه‌ڵـناو. تـه‌ڕفام؛ بـه زه‌وق ☚ خوش‌ذوق

**خۆش‌قه‌ده‌م** / xoşqedem/: ئاوه‌ڵـناو. پێ‌به‌ودم؛ پێ‌و قه‌ده‌م‌ممباره‌ک ☚ خوش‌قدم

**خۆشک** / xoşk/: ☜ **خوشك**

**خۆشکایی** / xoşkayî/: ناو. ئاسووده‌یی؛ بـێ‌خـه‌می ☚ آسودگی

**خۆشکوڵ** / xoşkuł/: ئاوه‌ڵـناو. تایبه‌تمه‌ندی شتێک که زوو بکوڵێ ☚ زودپخت

**خۆشکۆک** / xoşkok/: ئاوه‌ڵـناو. ڕند؛ گۆزه‌ڵ؛ جـوان؛ خوشیک ☚ زیبا

**خۆشکه** / xoşke/: ئاوه‌ڵناو. خوه‌شه؛ نه‌تاڵ ☚ شیرین

**خۆشکێش** / xoşkêş/: ئاوه‌ڵناو. ۱. نه نه‌رم و نه توند (تووتن) ۲. ڕاهێندراو (ئه‌سپ) ☚ ۱. مُلایم (توتـون) ۲. تربیت شده (اسب)

**خۆشکێن** / xoş(i)kên/: ئاوه‌ڵناو. بێ‌فیـز؛ خاکه‌سـار؛ خۆبه‌زل‌نه‌زان ☚ فروتن

**خۆشکێنی** / xoş(i)kênî/: ناو. بێ‌فیزی؛ خاکه‌ساری؛ خۆبه‌زل‌نه‌زانی ☚ فروتنی

**خۆشگله** / xoşg(i)le/: ☜ **خۆش‌گله‌یی**

**خۆش‌گله‌یی** / xoşg(i)leyî/: ئاوه‌ڵـناو. خـۆش‌گلـه؛ تایبه‌تمه‌ندی که‌سێ که هه‌میشـه گله‌یـه‌کی بـه ده‌سته‌وه‌یه ☚ اهل گله؛ همیشه گله‌مند

**خۆشگوزه‌رانی** / xoşguzeranî/: ناو. عه‌یش؛ ڕه‌وتی خۆش ڕابواردن ☚ خوشگذرانی

**خۆش‌گۆشت** / xoşgoşt/: ئاوه‌ڵناو. ۱. خاوه‌ن گۆشتی بـه‌تام ‹کـه‌و مـه‌لێکی خـۆش‌گۆشـته› ۲. خـاوه‌ن گۆشتێ که زوو گۆشته‌زوون بهێنێتـه‌وه و خـۆش بێته‌وه ☚ ۱و۲. خوش‌گوشت

**خۆش‌مامڵـه** / xoşmam(i)łe/: ئاوه‌ڵـناو. خۆش‌مامه‌ڵه؛ سه‌وداخۆش ☚ خوش‌معامله

**خۆش‌مامه‌ڵه** / xoşmamełe/: ☜ **خۆش‌مامڵه**

**خۆشـمه‌زه** / xoşmeze/: ئاوه‌ڵـناو. خۆشـتام؛ خۆش‌چێژه؛ به له‌زه‌ت ☚ خوشمزه

**خۆش‌مه‌شره‌ب** / xoşmeşreb/: ☜ **خۆش‌مه‌شره‌ف**

**خۆش‌مه‌شـره‌ف** / xoşmeşref/: ئاوه‌ڵـناو. خۆش‌مه‌شره‌ب؛ زمان‌خۆش و خۆشڕوو ☚ خوشرو و شیرین‌زبان

**خۆشـنان** / xoşnan/: ئاوه‌ڵـناو. نـان‌بـده؛ دلاوا ☚ بخشنده؛ سخاوتمند

**خۆشناو**[1] / xoşnaw/: ناو. جـۆرێ تـرێ ڕه‌شـه ☚ نوعی انگور سیاه

**خۆشناو**[2]: ئاوه‌ڵناو. ناو به چاکه ده‌رچوو. هـه‌روه‌ها: **خۆشناوی** ☚ خوشنام

**خۆش‌نشـین** / xoşn(i)şîn/: نـاو. ئـه‌و ڕه‌عیه‌تـه‌ی ده‌توانێ له دێ بار کا. هه‌روه‌ها: **خـۆش‌نشینی** ☚ خوش‌نشین

**خۆش‌نڤیس** / xoşn(i)vîs/: ☜ **خۆشنوس**

**خۆشنوس** / xoşnûs/: ناوەڵناو. خۆش‌نڤیس؛ خەت‌خۆش؛ خەتات؛ خاوەن خەتی جوان و ڕازاوە ☰ خوشنویس

**خۆشنوسی** / xoşnûsî/: ناو. خۆش‌نڤیسی؛ جوان‌نووسی؛ گوندەنووسی؛ خەتاتی؛ هونەری نووسین بە جوانی ☰ خوشنویسی

**خۆش‌وبشی** / xoş û b(i)şî/: ☜ **خۆش‌وبێش**

**خۆش‌وبێش** / xoş û bêş/: ناو. خۆش‌وبشی؛ خۆش‌وچۆنی؛ خۆشی‌وبۆشی؛ چاک و خۆشی؛ چاک و چۆنی ☰ خوش‌وبش؛ احوالپرسی

**خۆش‌وچۆنی** / xoş û çonî/: ☜ **خۆش‌وبێش**

**خۆشە**[1] / xoşe/: ناو. ١. ناوکەخۆشە؛ پێشەخۆشە؛ دەنکی شیرینی میوە ٢. چەرمی خۆش‌کراو ٣. هەلاڵ‌وتاڵ؛ دەرمانی چەرم خۆش کردن ٤. گوڵی دەخڵ ☰ ١. هستەی شیرین ٢. چرم دباغی‌شده ٣. داروی دباغی ۴. سُنبلەی گندم و جو

**خۆشە**[2]: ناوەڵناو. ١. شیرن و خواردنی ‹قەیسی ناوک خۆشە› ٢. خۆشەکراو ‹پێستەی خۆشە› ☰ ١. شیرین ٢. قابل مصرف

⊡ **خۆشە کردن**: ١. تێک‌هەڵشێلان و باش تێکەڵ مردن (وەک بۆ قوڕ و کاگڵ و ...) ٢. فێر کردن و ڕاهێنان (وەک بۆ منال و تازەکار دەکرێ) ٣. بە کولاندن، تالی و تامی ناخۆش لێ سڕینەوە (وەک بۆ ناوکەچەقالەی تال دەکرێ) ٤. پاک و خاوێن کردنەوە و ئامادە کردن بۆ دە کار چوون (وەک بۆ پێست دەکرێ) ٥. پوخت و قاڵ کردن و خاراندنی مرۆڤ لە کاروبارێکدا ✱ هەروەها: **خۆشە بوون** ☰ ١. خوب سرشتن ٢. بار آوردن ٣. چیزی را جوشاندن و تلخی یا تندی آن را گرفتن ۴. دباغی کردن ۵. پروردن

**خۆشەتاڵە** / xoşetałe/: ناو. کاهووی دەشتەکی ☰ کاهوی بیابانی

**خۆشەجان** / xoşecan/: دۆعا. نۆشی گیان ☰ نوش جان

**خۆشەچن** / xoşeçin/: ناو. خۆشەچین؛ گوڵ‌هەڵگرەوە؛ هێشووگەر؛ هێشووکەر؛ وشووکەر؛ لەتەچن؛ ویشی‌چن؛ وێشی‌چن؛ وێشی‌کەر؛ داشی؛ قورف؛ گوڵچن؛ کەسێ کە گوڵی بەجێماو لە خەرمان کۆ دەکاتەوە ☰ خوشەچین

**خۆشەچین** / xoşeçîn/: ☜ **خۆشەچن**

**خۆشەخانە** / xoşexane/: ☜ **خۆشخانە**

**خۆشەکراو** / xoşek(i)raw/: ناوەڵناو. پەروەردە؛ خۆشە ☰ پرورده

**خۆشەگۆشت** / xoşegoşt/: ناو. کەبابی شیلاخەی مەڕ و شەک ☰ خوش‌گوشت

**خۆشەوی** / xoşewî/: ☜ **خۆشەویست**[1]

**خۆشەویس** / xoşewîs/: ☜ **خۆشەویست**

**خۆشەویست**[1] / xoşewîst/: ناوەڵناو. خۆشەویس؛ خوەشەویس؛ خۆشەوی؛ خۆشتەوی؛ لەبەردڵان ‹کۆیلەتی باوی نەماوە، کیژی کوردی خۆشەویست!/ ڕاپەڕە، هەستە لە خەو، ئاخر چ وەختی خەوتنە؟ «هێمن»› ☰ محبوب

▪ **خۆشەویست**[2]: پاشەوشە. ـخوەشەویس؛ ـخۆشەویس؛ ـخۆش؛ حەزپێ‌کەر؛ خواز ‹منال‌خۆشەویست؛ ولاتخۆشەویست› ☰ ـ دوست

**خۆشەویستی** / xoşewîstî/: ناو. خۆشەویسی؛ خوەشەویسی: ١. دلۆڤانی؛ میهرەوانی ‹قسەی وا پیرۆزی پڕ خۆشەویستی/ تێی ئەگا هەر لاوێک، بە گوێی دڵ، بیستی «گۆران»› ٢. دلداری؛ ئەڤینی ‹ئەگەر دەیزانی مانای خۆشەویستی ئەم کچە کوردە/ بە سەد یاقووت و گەوهەر نەیدەدا فرمێسکی ئاڵی من «هێمن»› ٣. لەبەردڵانی؛ دۆخی خۆشەویست بوون ‹نەونەمامێ بووم لەم خاکە ڕوام/ بە خۆشەویستی ولات ئاودرام «یونس دلدار»› ☰ ١. محبت ٢. دلدادگی ٣. محبوبیت

**خۆشەویسی / xoşewîsî/:** ☜ **خۆشەویستی**

**خۆشهەڵکێشە / xoşhełkêşe/:** ناو. یابخووز؛ گیایەکە وەک تاڵوو، بەلام گەلاکەی پانترە، لاسقی سپی و گوڵی زەردە، لە نێو گەنمەجاڕدا شین دەبێ ☰ گیاهی است

**خۆشهیم / xoşhîm/:** ☜ **خۆش‌خیم**

**خۆشی / xoşî/:** ناو. خوەشی: ١. ئاسوودەیی؛ ڕەحەتی ‹غەمی خۆشی نییە مەحوی لە دلیا، هەر غەمی تۆیە/ لە عیشقتدا دەکەم غەم بۆ بە غەم، بروانە چۆنم بۆت! «مەحوی»› ٢. شادی؛ بەدەماخی؛ تەڕدەماخی ‹کە بیستی مژدەیی تەشریفی تۆ، عاشق لە خۆشیدا / گیانی مابوو تەنها وو ئەویشی زوو نیساری کرد «ئەحمەد موختار بەگ»› ٣. دۆخی بەلەزەت بوون ٤. ساقی؛ لەش‌ساغی ‹بۆ شەوی خۆشی و نەخۆشیم یادگاری/ ڕەمزی ئینتزاری «سوارە»› ٥. ئاشتی؛ تەبایی ٦. دنیای بێ‌بارشت و بێ‌سەرما ☰ ١. آسایش ٢. شادی ٣. خوشمزەگی ۴. سلامت ۵. آشتی ۶. هوای بدون بارش و سرما

▣ **خۆشی لە کەسێک** خۆزگە بە کەسێک (کاتێ دەگوترێ کە کەسێک بارودۆخێکی خۆشی ببێ یان چاوەڕێی ڕووداوێکی خۆش بێ) ‹شنەی بادی بەهاری هاتەوە، خۆشی لە تۆ بولبول/ بە شایی هاتی گوڵ کۆکی کە سازی چەهچەهە و غولغول «مەحوی»› ☰ خوشا به حال کسی

▣ **خۆشی دانە ژێر دڵ** */کینایە/* ١. لە خۆشیدا هار بوون؛ قەدری ئاسایش و ئاسوودەیی نەزانین و هەوڵ دان بۆ تێکدانی ٢. لەقە لە بەختی باشی خۆ دان ☰ ١. خوشی زیر دل کسی زدن ٢. لگد به بخت خود زدن

**خۆشیان / xoş(i)yan/:** ناو. ١. خۆشی؛ خوەشی ‹لە خۆشیان و ناخۆشیان یار و هەواڵی یەکتر بوون› ٢. ڕۆژانی بێ‌بارشت لە زستاندا ☰ ١. خوشحالی ٢. اوقات بی بارندگی در زمستان

**خۆشی‌خۆشی / xoşîxoşî/:** ناو. ١. هومێدی بەهێز ‹بە شەڕ هاتن ڕەقیب و مووددەعی، من خۆشی‌خۆشیمە/ کە دەعوایە، لە هەر لایە بکوژرێ سوودی ئیسلامە «نالی»› ٢. کەیف و شادی ‹ئەسیرت وەقتی کوشتن شادەمەرگن، ناگەنە کوشتن/ لە خۆشی‌خۆشیا ڕۆحی فڕیوە تا چووە مەزبەح «مەحوی»› ☰ ١. امیدواری ٢. شادی و سرور

**خۆشیوبۆشی / xoşîwboşî/:** ☜ **خۆش‌وبێش**

**خۆف / xof/:** ناو. ترس ‹هام نە سەرقوللەی خۆف و ڕەجاوە/ نمەز ڕا ئی لان یا خۆ ئەو لاوە «مەولەوی»› ☰ خوف

▣ **خۆف هاوردنە بەر خۆ** ترس خستنە بەر خۆ ‹وەختێ ئەچیتە تاریکی خۆف مەیرا بەر خۆت› ☰ ترس به دل راه دادن

**خۆف کەسێ شکیان** ترسی کەسێ ڕەوینەوە ‹تەنیا بچۆ با خۆفت بشکێ› ☰ ترس کسی ریختن

**خۆفرۆش / xof(i)roş/:** ناوەڵناو. ١. حیز؛ گاندەر بۆ پارە ٢. */کینایە/* سیخوڕ؛ شۆفار ☰ ١. خودفروش ٢. جاسوس

**خۆفک / xofik/:** ناو. ڕەحەتی ☰ قیف

**خۆفناک / xofnak/:** ناوەڵناو. نەتڵ؛ هەیبەتناک؛ ورەبەر ☰ خوفناک

**خۆفیە / xof(i)ye/:** ناو. سیخوڕی ☰ جاسوسی

**خۆفیەگەر / xof(i)yeger/:** ناو. سیخوڕ؛ شۆفار ☰ جاسوس

**خۆفیەگەری / xof(i)yegerî/:** ناو. سیخوڕی؛ شۆفاری ☰ جاسوسی

**خۆکار / xokar/:** ناوەڵناو. خۆمەش؛ خۆگەڕ؛ بە تایبەتمەندی یان توانایی سەربەخۆ کار کردن، بێ نیاز بە دەستێوەردانی کەسێک ☰ خودکار

**خۆکرد / xok(i)rd/:** ☜ **خۆکردی**

**خۆکردوو / xokirdû/:** ☜ **خۆکرد**

**خۆکردی / xok(i)rdî/:** ناوەڵناو. خۆکرد: ١. */پەلار/*

خۆهەڵبەست؛ خۆدەرهێن؛ لەخۆیی؛ بێسەرەوبەرە ‹کەس بە ئەلفازم نەڵێ خۆ کوردییە، خۆکردییە/ هەر کەسێ نادان نەبێ خۆی تالیبی مەعنا دەکا «نالی»› ٢. خۆکردوو؛ خۆکردە؛ جێبەجێ بوو بە هۆی خودی کەسەوە ‹حیکایاتی غەریبی پێیە بولبول جوملە خۆکردی/ دەڵێی چاپاری ئێران رۆژنامەی ئەختەری هێنا «وەفایی»› ≌ ١. من‌دراوردی ٢. خودکردە

**خۆکوژی** / xokujî/: ناو. کاری خۆ کوشتن؛ خۆ لە ناو بردن ≌ خودکشی

**خۆگر** / xogir/: ئاوەڵناو. خۆگیر: ١. خۆڕاگر؛ بەسەبر ٢. بەردەوام ٣. بەرگەگر ٤. خۆبایی؛ قۆڕەدەماخ؛ فیسن؛ بەفیز ٥. کەم‌کار ٦. گرساو؛ وەستاو. هەروەها: **خۆگری** ≌ ١. باتحمل ٢. پایا ٣. مقاوم ۴. مُتکبر ۵. کم‌کار ۶. مُنعقد

**خۆگرتوو** / xogirtû/: ئاوەڵناو. خۆگرتی: ١. خۆگر؛ خۆڕاگر؛ خۆدار ٢. پاوەجا؛ پتەو؛ چەقیو ٣. کامەران؛ بەختەوەر ٤. مەییو؛ گرساو ٥. گوێگر لە قسەی خەڵک بە نهێنی ≌ ١. باتحمل ٢. استوار ٣. کامگار ۴. بندآمده ۵. فالگوش ایستاده

**خۆگرتی** / xogirtî/: ☜ **خۆگرتوو**

**خۆگومکەر** / xogumker/: ئاوەڵناو. نوخافتۆر؛ خۆدز لە فەرمان ≌ از زیر کار دررو

**خۆگەڕ** / xogeř/: ☜ **خۆکار**

**خۆگیر** / xogîr/: ☜ **خۆگر**

**خۆل** / xol/: ئاوەڵناو. حۆل؛ خول؛ گێژ و گێل ≌ خُل

**خۆلەخۆلە** / xolexole/: دەنگەناو. دەنگی بانگ کردنی بەرخ ≌ صوت خواندن برّه

**خۆلی** / xolî/: ☜ **خۆڵەکەوە**

⊡ **خۆلی کردن**: ترساندن ≌ ترساندن

**خۆلیاڤ** / xolyav/: ناو. بوولاو؛ مشکی و ئاوی لێکدراو ≌ خاکسترآب

**خۆڵی‌پفک** / xolîpif(i)k/: ناو. ژیلە؛ خۆڵەکەوەی گەرم و ئاگراوی ≌ خاکستر گرم

**خۆڵیدان** / xolîdan/: ناو. خولیدان؛ خولیدانک؛ تەپلەک؛ ژێرجگەرە؛ ژێرسیگار ≌ زیرسیگاری

**خۆڵی‌سەر** / xolîser/: ئاوەڵناو. /مەجاز/ کلۆڵ؛ بێچارە ≌ بیچارە

**خۆڵ**[١] / xoł/: ناو. خوەڵ؛ خۆر: ١. ئاخ؛ خاک؛ گڵ ‹خۆڵ لە دۆی خۆت مەکە! «مەسەل»› ٢. خاکە؛ گەرد؛ ئارد؛ بەرهەمی وردی شتی هاڕاو ٣. زبڵ؛ شخەڵ ‹تەنەکەی خۆڵ› ≌ ١. خاک ٢. خاکە ٣. آشغال

⊡ **خۆڵ کردنە دۆشاو/ دۆی کەسێ**: /کینایە/ دڕک کردنە ناو ئارد کەسێ؛ زیان بە کەسێ گەیاندن ≌ خاک در آتش کسی کردن

**خۆڵ لە پارووی خۆ کردن**: /کینایە/ زیان بە خۆ گەیاندن ≌ ضرر به خود زدن

**خۆڵ لە چاو کردن**: /کینایە/ فریو دان ≌ فریب دادن

**خۆڵی مردوو بە سەر کەسێ/ شوێنێکدا بێژتن/ کردن**: /کینایە/ جم‌وجووڵی ژیان لە کەسێ/ شوێنێکدا نەهێشتن ‹ئاگری نەورۆزمان لە هیتلەر بەردا/ خۆڵی مردوومان بێژا بەسەردا «پیرەدمێرد»› ≌ خاک مرده روی کسی/ جایی پاشیدن

**وەک خۆڵ وا بوون**: /کینایە/ زۆر و زەوەند بوونی شتێک ≌ خیلی فراوان بودن

**خۆڵ**[٢]: پێرۆ. ← **خڕوخۆڵ**/ **خەستوخۆڵ**

**خۆڵاو** / xoław/: ناو. ١. خۆڵەمێشاوێ کە بۆ سابوون چێ‌کردن بە کەڵکە ٢. ئاو و خۆڵی مێوژ تێ هەڵکێشان ≌ ١. تیزاب صابون‌سازی ٢. تیزاب مویزسازی

**خۆڵاوی** / xoławî/: ئاوەڵناو. خاکاوی؛ تۆزاوی ‹جل‌وبەرگەکەی خۆڵاوی بوو› ≌ خاک‌آلود

**خۆڵبەسەر** / xołbeser/: ئاوەڵناو. /کینایە/ چارەڕەش

و کولۆڵ 🇮🇷 خاک‌برسر

**خۆڵماڵ** / xołmał/: ناو. مشت و ماڵی شیر و خەنجەر 🇮🇷 صیقل شمشیر و مانند آن

**خۆڵنجان** / xołincan/: ناو. قۆریجان؛ کۆلنجان؛ قۆلنجان؛ قۆلیجان 🇮🇷 خولنجان

**خۆڵوشیر** / xoł û şîr/: ناو. شیوەران؛ خاکشیر؛ خوەلەشێرە؛ خاشیرە: ١. پاقلانجی؛ پەقلانجقە؛ پاقلانچکە؛ پاقلانجقی؛ پاقلەجقی؛ گیایەکی یەکسالانە تایبەتی ناوچەی کەمئاو، بە گەلای برگە-برگەی زۆر و گوڵی زەرد و ڕۆشن و تۆمی وردەوە ٢. بەری وردی ئەو گیایە کە بۆ دەرمان باشە 🇮🇷 ١و٢. خاکشیر

**خۆڵەبان** / xołeban/: ناو. ڕێژاخ؛ گڵەبان 🇮🇷 خاک پشت‌بام

**خۆڵەپۆت** / xołepot/: ☜ خۆڵەپۆتینە

**خۆڵەپۆتە** / xołepote/: ☜ خۆڵەپۆتینە

**خۆڵەپۆتین** / xołepotîn/: ☜ خۆڵەپۆتینە

**خۆڵەپۆتینە** / xołepotîne/: ناو. خۆڵەپۆت؛ خۆڵەپۆتە؛ خۆڵەپۆتین؛ خۆڵەپۆتێ؛ کۆی خاکی زۆر نەرم و ورد 🇮🇷 کلجان

**خۆڵەپۆتێ** / xołepotê/: ☜ خۆڵەپۆتینە

**خۆڵەپۆک** / xołepok/: ناو. بێستانی بژار کراوی پاک 🇮🇷 جالیز پاک‌شده از گیاه هرز

**خۆڵەپەتانێ** / xołepetanê/: ناو. کار و ڕەوتی گەمە بە خۆڵ کردن 🇮🇷 خاکبازی

**خۆڵەژان** / xołejan/: ناو. نەخۆشین بە هۆی گڵ خواردنەوە 🇮🇷 عارضه‌ای که از خوردن خاک پدید می‌آید

**خۆڵەسوورە** / xołesûre/: ناو. خاکەسوورە؛ چەشنێ خاکی نەرمی دەنک وردە لە هەورگەری و کوورەخاناندا بە کار دێ 🇮🇷 خاک رس

**خۆڵەکو** / xołekû/: ☜ خۆڵەکەوە

**خۆڵەکەوان** / xołekewan/: ناو. خوەڵەکەوان: ١. کۆی خۆڵەمێش و زبڵ و زاڵ ٢. شوێنی تایبەت بۆ ڕۆ کردنی خۆڵەمێش و زبڵ و زاڵ 🇮🇷 ١. تودەی خاکستر و زباله ٢. خاکدان

**خۆڵەکەوە** / xołekewe/: ناو. خوەلەکەوو؛ خۆڵەکوو؛ خۆڵەمژ؛ خۆڵەمشکی؛ خۆڵەمێش؛ خۆڵی 🇮🇷 خاکستر

**خۆڵەمڕ** / xołemiř/: خۆڵەمڕە: ١. خۆڵەکەوە ٢. خۆڵەپۆتینە 🇮🇷 ١. خاکستر ٢. کلجان

**خۆڵەمڕە** / xołem(i)ře/: ☜ خۆڵەمڕ

**خۆڵەمژ** / xołemij/: ☜ خۆڵەکەوە

**خۆڵەمشکی** / xołemişkî/: ☜ خۆڵەکەوە

**خۆڵەمێش** / xołemêş/: ☜ خۆڵەکەوە

**خۆڵەمێشدان** / xołemêşdan/: ناو. بوولدان 🇮🇷 جای خاکستر

**خۆڵەمێشی** / xołemêşî/: ئاوەڵناو. بۆر؛ بۆڵە؛ سەمەن 🇮🇷 خاکستری

**خۆڵی** / xołî/: ناو. بۆڵە؛ بووڵ؛ بۆر 🇮🇷 خاکستر

**خۆماک** / xomak/: ناو. غەریزە؛ خدوو 🇮🇷 غریزه

**خۆماڵی** / xomałî/: ئاوەڵناو. ١. تایبەتی ماڵی خۆ ٢. ماڵی؛ کەوی ٣. ☜ خۆمانە[1] 🇮🇷 ١. اختصاصی ٢. خانگی ٣. ☜ خۆمانە[1]

**خۆماڵیانە** / xomał(i)yane/: ☜ خۆمانە[2]

**خۆمان** / xoman/: جێناو. خوەمان؛ هۆمان 🇮🇷 خودمان

**خۆمانە**[1] / xomane/: ئاوەڵناو. خۆمانی؛ خۆماڵی؛ خوەمانی؛ خۆمانییانە؛ بەش بە خۆمان ‹میوانی خۆمانە› 🇮🇷 خودمانی

**خۆمانە**[2]: ئاوەڵکار. خۆمانی؛ خوەمانی؛ خۆماڵیانە؛ خۆمانییانە؛ بە شێوەیەکی دۆستانە، بێ‌ئاوڕدانەوە لە ڕەسم و یاسا ‹خۆمانە دەجوولێتەوە› 🇮🇷 خودمانی

**خۆمانەخۆمانە** / xomanexomane/: ناو. کەین‌وبەین؛ کار و ڕەوتی پێکهاتنی بە نهێنی لە سەر کارێک 🇮🇷 تبانی

**خۆمانی / xomanî/:** ☜ **خۆمانە**

**خۆمانییانە / xomanîyane/:** ☜ **خۆمانە**

**خۆمەش / xomeş/:** ☜ **خۆکار**

**خۆمین / xomîn/:** چاوگ. کۆما کردن؛ بە سەر یەکدا کردن ⊒ انباشته کردن

**. خۆن / xon/:** ☜ **ـ خۆنە**[3]

**خۆناس / xonas/:** ئاوەڵناو. ١. تایبەتمەندی کەسێ کە قەدری خۆی دەزانێ ٢. ناسیاو؛ ئاشنا ⊒ ١. خودشناس ٢. آشنا

**خۆناسیو / xonasîw/:** ئاوەڵناو. *[کنایە]* بلۆق؛ بالغ؛ پێگەیشتوو ⊒ بالغ

**خۆنای / xonay/:** چاوگ. کەناندن؛ هێنانە پێکەنین ⊒ خنداندن

**خۆندکار[1] / xondkar/:** ☜ **خوێندکار**

**خۆندکار[2]:** ئاوەڵناو. خوێندەوار؛ سیوات‌دار ⊒ باسواد

**خۆندگا / xondga/:** ☜ **خوێندنگە**

**خۆندن / xondin/:** ☜ **خوێندن**

**خۆندنگا / xondinga/:** ☜ **خوێندنگە**

**خۆندنەوە / xond(i)newe/:** ☜ **خوێندنەوە**

**خۆندەوار / xondewar/:** ☜ **خوێندەوار**

**خۆندەوان / xondewan/:** ☜ **خوێندەوار**

**خۆندی / xondî/:** ☜ **خوێندەوار**

**خۆنک / xonik/:** ناو. ماستێر؛ ڕەحەتی ⊒ قیف

**خۆنما / xon(i)ma/:** ئاوەڵناو. خۆوین؛ خۆپەسەن ⊒ خودبین

**خۆنمایی / xon(i)mayî/:** ناو. ١. خۆنوێنی؛ کار یان چۆنیەتی نیشاندان و ڕانانی جوانی، دارایی یان کارایی خۆ؛ خۆنواندن؛ خۆڕانان؛ خۆ نوانن؛ خۆ بە غللووری نیشاندان ٢. کار و ڕەوتی خۆ دیار خستن ⊒ ١و٢. خودنمایی

**خۆنن / xonin/:** ☜ **خوێندن**

**خۆننەوە / xonnewe/:** ☜ **خوێندنەوە**

**خۆنوێن / xon(i)wên/:** ئاوەڵناو. خۆنما؛ فیزن؛ خوو یان ئۆگرەتی زەینی کەسێک بەوەی خۆی باشتر و بەرزتر لە دیتران بزانێ. هەروەها: **خۆنوێنی** ⊒ خودبین

**خۆنووس / xonûs/:** ناو. ١. قەڵەم پاندان ٢. خودکار؛ قەڵەم‌ئۆوچ ⊒ ١. خودنویس ٢. خودکار

**خۆنە[1] / xone/:** ناو. ١. پنە؛ تەختەی پانی ئەنگووتک لە سەر پان کردنەوە ٢. دیزە؛ دێزە ٣. پشیلەی نێر ⊒ ١. تخته‌ای که خمیر بر آن پهن کنند ٢. دیزی ٣. گربه‌ی نر

**خۆنە[2]:** ئاوەڵناو. بێ‌خاوەن ⊒ بی‌صاحب

**ـ خۆنە[3]:** پاشەوشە. ـ خۆن؛ ـ خووین؛ پارێز ‹دەرخۆنە› ⊒ ـ بان؛ ـ بند

**خۆنەگر / xonegir/:** ئاوەڵناو. ١. نەبەگە؛ شل و شەوێق ٢. بێ‌سەبر؛ بێ‌تاقەت ⊒ ١. شُل و وِل ٢. ناشکیبا

**خۆنەوار / xonewar/:** ☜ **خوێندەوار**

**خۆنەواری / xonewarî/:** ☜ **خوێندەواری**

**خۆنیا / xonya/:** ☜ **خۆڕسك**

**خۆو / xow/:** ☜ **خەون**

**خۆوالی / xowalî/:** ئاوەڵناو. خەواڵوو؛ خەواوی؛ بێداری هێشتا چاوبەخەو ⊒ خواب‌آلود

**خۆواو / xowaw/:** ناو. ئاوێ کە مەزرا بە شێوەی سروشتی ئاژین دەکا ⊒ آبی که به صورت طبیعی زمینی را آبیاری می‌کند

**خۆوبەخت / xo w bext/:** ناو. خوابەختەکی؛ شانسی ⊒ شانسی

**خۆوبەختی / xowbextî/:** ئاوەڵکار. بەختەکی؛ بە هەڵکەوت ⊒ تصادفی؛ اتفاقی

**خۆوخدە / xowx(i)de/:** ناو. خولقەت ⊒ خُلق

**خۆولاتی / xow(i)łatî/:** ☜ **هاوولاتی**

**خۆوەدوادەر / xowed(i)wader/:** ئاوەڵناو. قـزەک؛ کەمتەرخەم لە کار کردن ⊒ سهل‌انگار

**خۆوەر / xower/:** ☜ **خۆڕسك**

**خۆوەشارتو / xoweşartû/**: ئاوەڵناو. پەناگرتوو ≡ پنهان شده

**خۆوین / xowîn/**: ئاوەڵناو. خۆنما ≡ خودبین

**خۆوێژ / xowêj/**: ناو. بوێژ؛ شاعیری دەسبەجێ؛ شاعیرێ کە بێبیر کردنەوە شیعر دەڵێ ≡ شاعر ارتجالی

**خۆوێژی / xowêjî/**: ناو. بوێژی؛ کاری دەسبەجێ گوتن؛ بێبیر کردنەوە شیعر گوتن یان وتار دان ≡ بدیهه گویی

**خۆهـ / xoh/**: ناو. ١. خۆ؛ ئارەقەی لەش ٢. ئاونگ؛ شەونم ٣. خەندە؛ کەن؛ کاری پێکەنین؛ کەنین؛ خەنین ٤. خوشک؛ خۆیشک؛ خوەیشک؛ خوار ٥. خێو؛ خاوەن؛ ساحێو ≡ ١. عرق بدن ٢. شبنم ٣. خنده ۴. خواهر ۵. صاحب

▣ **خۆهـ دان**: ئارەق کردن ≡ عرق کردن

**خۆهر / xohr/**: ئاوەڵناو. خوار؛ لار؛ چەوت؛ چەوێڵ؛ کەچ ≡ کج

**خۆهرا / xohra/**: ئاوەڵناو. خۆرا؛ زۆرخۆر؛ فرەخۆر ≡ پُرخور

**خۆهری / xohrî/**: ناو. خواری؛ لاری؛ ناڕاستی ≡ کجی

**خۆهزا / xohza/**: ناو. خوارزا؛ خوشکەزا ≡ خواهرزاده

**خۆهستن / xohistin/**: ☜ **خواستن**

**خۆهستەگ / xohisteg/**: ئاوەڵناو. خوازۆک؛ خوازەڵۆک؛ خۆستۆخ ≡ آزمند

**خۆهستی / xohistî/**: ☜ **خوازبێنیکەر**

**خۆهـ ماڵ / xohmał/**: ناو. خاوەنماڵ ≡ صاحبخانه

**خۆهەستەگ / xohesteg/**: ناو. سواڵکەر؛ دەرۆزەکەر؛ خواسکەر ≡ گدا

**خۆهەڵبەست / xohełbest/**: ناو. بوختان و درۆ ≡ افترا

**خۆهەڵقوتێن / xohełqutên/**: ☜ **خۆتێهەڵقوتێن**

**خۆهەڵکێش / xohełkêş/**: ئاوەڵناو. خۆپەسێن؛ خۆپەسندەر؛ فۆرتەک؛ منمنۆک؛ خاوەن هوکارە یان ئۆگرەتی بە خۆدا هەڵگوتن ≡ خودستا

**خۆهەڵکێشی / xohełkêşî/**: ناو. بافیش؛ کاری بە خۆدا هەڵگوتن ≡ خودستایی

**خۆی / xoy/**: ناو. ١. ئارەقەی لەش ٢. شەونم؛ ئاونگ ≡ ١. عرق بدن ٢. شبنم

▣ **خۆی بون**: ئاونگ لێ کەوتن ≡ شبنم زدن

**خۆیا / xoya/**: ئاوەڵناو. دیاری؛ ئاشکرا ≡ آشکار

**خۆیان / xoyan/**: ناو. کلۆشی گێرەکراوی خڕەوەبووی شەننەکراو ≡ کسته

**خۆیانی / xoyanî/**: ئاوەڵناو. ناسیاو؛ ئاشنا ≡ آشنا

**خۆیایەتی / xoyayetî/**: ☜ **خزمایەتی**

**خۆیشک / xoyş(i)k/**: ☜ **خوشك**

**خۆیشکەزا / xoyşkeza/**: ☜ **خوشکەزا**

**خۆیەتی / xoyetî/**: ☜ **خزمایەتی**

**خۆیی / xoyî/**: ئاوەڵناو. خۆیایەتی؛ پێوەندیدار یان سەر بە خۆوە ≡ خودی

**خو[1] / xû/**: ناو. ١. نەریت؛ خدە ‹یەکێ عاشق بە خوو، یەک تالیبی ڕوو/ یەکێ مەجبووری بۆ، یەک مایلی ڕەنگ «مەحوی»› ٢. فێ؛ نەخۆشی فێداری ٣. بەراز ≡ ١. خوی ٢. صرع ٣. خوک

▣ **خو گرتن**: ١. فێری نەریت بوون ٢. هۆگر بوون ≡ ١. عادت کردن ٢. الفت گرفتن

**خو[2]**: دەنگ. وشەیەکە بۆ ترساندنی لەپڕ و بێخەبەر ≡ کلمەی ترساندن و شُکه کردن

. **خو[3]**: پاشەوشە. کردار؛ ڕەوت ‹بەدخوو› ≡ ـ خو

**خوپێگرتو / xûpêgirtû/**: ئاوەڵناو. هۆگر؛ گیرۆدە ≡ مأنوس

**خوتەکە / xûteke/**: ئاوەڵناو. مژمۆر؛ پرووشەچاو؛ چاوچکۆلە ≡ دارای چشمانی کوچک

**خوخنک / xûxink/**: ☜ **خمخم[1]**

**خـود / xûd/**: ناو. خوودە؛ کڵاوی ئاسن ≡

کلاهخود

**خـودار** / xûdar/: ئاوەڵـناو. ١. فێـدار؛ تووشـیاری نەخۆشی فێ ٢. *[کنایە]* شێت؛ لێوە ﷼ ١. صـرعی ٢. دیوانە

**خوداری** / xûdarî/: ☜ **خێداری**

**خودە** / xûde/: ☜ **خود**

**خور** / xûr/: ناو. سپیدار ﷼ سپیدار

**خـورژی** / xûrjî/: نـاو. نارەحـــەتی و قەڵســـی و تووڕەیی زۆر ﷼ عصبانیت شدید

**خورما** / xûrma/: ☜ **خورما**

**خـوز**[1] / xûz/: نـاو. ١. هێــز؛ توانــا؛ وزە ٢. ☜ **خوسار** ٣. ئەوک؛ قـوڕگ؛ قـوڕی ﷼ ١. قـدرت ٢. ☜ **خوسار** ٣. گلو

⊡ **خوز تێگەڕان**: خووز تێگەڕانـەوە؛ بووژانـەوە؛ وە کەیف هاتن دوای لاوازی ﷼ دوباره نیرو گرفتن

**خوز تێگەڕانەوە**: ☜ **خوز تێگەڕان**

**خـوز هێنانـەوە**: ١. سـاڕێژ بوونـەوەی بـرین ٢. جۆش خواردنەوەی پێشەی شـکاو ﷼ ١. التیـام یافتن زخم ٢. جوش خوردن استخوان شکسته

**خوز**[2]: ئاوەڵناو. ١. ناپەسند ٢. کۆم؛ پشتچەماو ﷼ ١. ناپسند ٢. کوژ

**خوزیا** / xûzya/: ☜ **خۆزگە**

**خـوزیان** / xûzyan/: چاوگ. پەسـند نـەکردن ﷼ نپسندیدن

**خوژ** / xûj/: ئاوەڵـناو. کووڕ؛ خووز؛ پشتچـەماو ﷼ کوژپشت

**خوس**[1] / xûs/: ☜ **خوسار**

**ـ خوس**[2]: پاشەوشە. ـ خـویس؛ لـە ئـاودا نـەرم بـوو ‹دێرخووس› ﷼ ـ خیس

**خوسا** / xûsa/: ئاوەڵـناو. نمیا؛ نمیای؛ نمی؛ نما ﷼ خیس خورده

**خوسـار** / xûsar/: نـاو. خـازی؛ خـوزە؛ خوسـار؛ خویسک؛ خوێز؛ خوێس؛ خووز؛ خـووس؛ خـویز؛ خوویز؛ خوویس؛ خوویسار؛ خیسار؛ زوقم؛ زۆقـم؛ زوخم؛ زوغـم؛ زەق؛ زق؛ زوخ؛ سـووخ؛ سـووخار؛ سیخوار؛ سیخار؛ زەمەگولیلک؛ شەڵـتە؛ ئاڵشـت؛ ئاڵشک؛ ئاڵیسکە؛ قەر؛ قورۆ؛ ئەڵماسە؛ چووەزمـا؛ چووەزنا؛ چووزنا؛ ئەزازیل؛ وەڕەق؛ قراقـە؛ قـراف؛ پژ؛ کەویەخ؛ کەوشەمە؛ دۆخ یان ڕەوتی بەسـتنی شـەونم لـە کـاتی سـارد بـوونی کەشـدا ﷼ پَـژ؛ سرماریزه

**خوسـان** / xûsan/: چـاوگ. تێنەپـەڕ. //خووسـای؛ دەخووسێی؛ بخووسێ// خویسان؛ خووسیان؛ نمان؛ نەرم بوون بە هۆی ئاو ‹نە نووسەکە پێوە نووسا، نـە لە بەر بارانێ خووسا/ نە زوقمی بەسەردا باری، نـە لـە قوڕدا کەوت باری «هێمن»› ﷼ خیسیدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: خووسـاو/ چاوگی نـەرێنی: نەخووسان

**خوساندن** / xûsandin/: چاوگ. تێپەڕ. //خووساندت؛ دەخووسێنی؛ بخووسێنە// خووسانن؛ خویسانن: ١. نماندن؛ لە ئاودا نەرم کردن ٢. *[کنایە]* سـەرجێی کـردن ‹دیـارە چۆتـەوە خووسـاندوویەتی!› ﷼ ١. خیساندن ٢. هماغوشی کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەخووساندن

**خوسـاندنەوە** / xûsand(i)newe/: چاوگ. دووبـارە خووساندن ﷼ دوباره خیساندن

**خوسانن** / xûsanin/: ☜ **خوساندن**

**خوسانەوە** / xûsanewe/: چاوگ. دووبارە خووسان ﷼ دوباره خیسیدن

**خوساو** / xûsaw/: ئاوەڵـناو. خووسیاو؛ خووسـیاگ؛ دە ئاودا نەرمکراو. هەروەها: **خووساوی** ﷼ خیسیده

**خوسە** / xûse/: ناو. شەونم؛ شەڤنم ﷼ شبنم

**خوسیاگ** / xûsyag/: ☜ **خوساو**

**خوسیان** / xûsyan/: ☜ **خوسان**

**خوسیاو** / xûsyaw/: ☜ **خوساو**

**خوک** / xûk/: ناو. خوێک؛ خووکی؛ مالیات؛ بـاج و

پیتاکی میری 🇮🇷 باج و خراج

**خوکی** / xûkî/: ☜ **خوك**

**خوگ** / xûg/: ناو. بەراز؛ وەراز؛ گاکوڵ 🇮🇷 خوک

**خوگانه**[1] / xûgane/: ئاوەڵناو. ١. پێوەندیدار یان هی خووگان ‹پیازە خووگانە› ٢. وەکوو خوو ‹ئیشتیای خووگانە؛ خووی خووگانە› 🇮🇷 ١و٢. خوکی

**خوگانه**[2]: ئاوەڵکار. وەک خووگ ‹خووگانە دەخوا› 🇮🇷 خوکی

**خوگرتوو** / xûgirtû/: ئاوەڵناو. خووگرتی: ١. فێربووی ڕەوشتێک ٢. هۆگر 🇮🇷 ١. خلق و خویی را آموخته ٢. مألوف

**خوگرتی** / xûgirtî/: ☜ **خوگرتی**

**خوگەراو** / xûgeřaw/: ناو. خووەڕاو: ١. کار و ڕەوتی ڕاو کردنی خووگ ٢. *[مەجاز]* شلۆقی و کەس‌لەکەسی ‹دە گوێ شل کە لە بۆ ئەم خووگەڕاوە/ کراسێکم هەیە گشتی دڕاوە! «قانع»› 🇮🇷 ١. شکار گراز ٢. بلوا و آشوب

**خوگەمله**[1] / xûgem(i)le/: ناو. گوریس‌کێشکێ 🇮🇷 مسابقەی طناب‌کشی

**خوگەمله**[2]: ئاوەڵناو. *[پەلار]* مل‌قەوی؛ مل‌ستوور 🇮🇷 گردن‌کلفت

**خول** / xûl/: ئاوەڵناو. ١. خووز؛ کۆم؛ پشت‌چەماو ٢. مل‌خوار؛ مل‌چەوت 🇮🇷 ١. کوژپشت ٢. گردن‌کج

**خولولیف** / xûlulîf/: ناو. ئەشکەوت 🇮🇷 غار

**خوڵ** / xûł/: ناو. غوول؛ دێو؛ ئەرژەنگ 🇮🇷 غول

**خوملکێ** / xûmilkê/: ناو. یارییەکی لاوان بە شێوەی زۆر کردن لە ملی یەکتر 🇮🇷 نوعی بازی جوانان

**خون** / xûn/: ☜ خوێن[1]

⊡ **خون بەردان**: خوێن بەردان 🇮🇷 رگ زدن

**خون دیتن**: تووشی سووڕی مانگانە بوون 🇮🇷 حیض شدن

**خونای** / xûnay/: چاوگ. کەنانـدن؛ هێنانە پێکەنین 🇮🇷 خنداندن

**خون‌پەستی** / xûnpestî/: ناو. تەوژمی خوێن 🇮🇷 فشار خون

**خوندی** / xûndî/: ناو. بووکنی؛ برازاوا؛ ئەوانەی دەچنە شوێنی بووک و دەیگوێزنەوە بۆ ماڵی زاوا 🇮🇷 ساقدوش

**خون‌ژەهری** / xûnjehrî/: ناو. ژەهراوی بوونەوەی خوێن 🇮🇷 مسمومیت خونی

**خونک** / xûnik/: ئاوەڵناو. ڕەپ 🇮🇷 شَق

**خونکار** / xûnkar/: ناو. میری زاڵم ‹خودای گەورە! بە دەس خۆتە هەموو کار/ لە سەرمان لابەرە بێدادی خوونکار «هێمن»› 🇮🇷 حاکم ستمگر

**خونگەرم** / xûngerm/: ☜ **خوێنگەرم**

**خونه** / xûne/: ناو. خۆیانی چەڵتووک؛ چەڵتووک کە هێشتا لە کا جیا نەبۆتەوە 🇮🇷 کستەی شالی

**خووه** / xûwe/: ☜ **خەراج**

**خووەراو** / xûweřaw/: ☜ **خوگەڕاو**

**خوهستن** / xûhistin/: ☜ **خواستن**

**خوی** / xûy/: ناو. خوو؛ خۆ؛ ئاکار؛ ڕەوشت 🇮🇷 خوی؛ روش

**خویرک** / xûyrik/: ناو. مۆرکە؛ مۆرانە؛ مۆرد؛ گازیز؛ قاروونە؛ وەرە؛ جانەوەری وردیلەی خوری خۆر 🇮🇷 بید

**خویز** / xûy(i)z/: ☜ **خوسار**

**خویزاندن** / xûyzandin/: چاوگ. زوقم کەوتن 🇮🇷 پَز زدن

**خویس** / xûys/: ☜ **خوسار**

**خویسار** / xûysar/: ☜ **خوسار**

**خویشک** / xûy(i)şk/: ☜ **خوشك**

**خویشکەزا** / xûyşkeza/: ☜ **خوشکەزا**

**خویل** / xûyl/: ئاوەڵناو. خوێل؛ خێل 🇮🇷 لوچ

**- خوین** / -xûyn/: ☜ **- خۆنه**[3]

**خویندەڤان** / xûyndevan/: ☜ **خوێندەوار**

**خوینەر / xûyner/**: ☜ **خوێنەخوار**

**خوینی / xûynî/**: ئاوەڵناو. مرۆکوژ 🇮🇷 قاتل

**خویە / xûye/**: ناو. ئارەق 🇮🇷 عرق

**خە[1] / xe/**: ناو. خوشک؛ خوار 🇮🇷 خواهر

**خە[2]**: جێناو. خۆ 🇮🇷 خود

**خەبات / xebat/**: ناو. ١. هەوڵ و تێکۆشانی زۆر بۆ گەیشتن بە ئامانجێک ‹خەبات بۆ سەرکەوتن› ٢. بەربەرەکانێ؛ شەڕ و پێکدادان لەگەڵ دژمن یان هاوملەدا بۆ سەرکەوتن ‹خەبات ڕزگار دەکا کۆیلە و ئەسیران/ لە ناخێ ڕادەکا مەزن و ئەمیران «هێمن»› 🇮🇷 ١و٢. مبارزە

◘ **خەبات کردن**: ١. هەوڵ دان بۆ گەیشتن بە ئامانجێ ٢. شەڕ کردن لەگەڵ دوژمن 🇮🇷 ١و٢. مبارزە کردن

**خەباتکار / xebatkar/**: ئاوەڵناو. خەباتگێڕ: ١. شەڕڤان ٢. تێکۆشەر؛ هەوڵدەر 🇮🇷 ١. مبارز ٢. کوشا

**خەباتکەر / xebatker/**: ناو. کارگەر؛ کرێکار 🇮🇷 کارگر

**خەباتگێڕ / xebatgêř/**: ☜ **خەباتکار**

**خەبار / xebar/**: ناو. بڤە؛ خەتەر؛ مەترسی 🇮🇷 خطر

**خەبتان / xebtan/**: چاوگ. خەبتین؛ خەبات کردن؛ تێکۆشان 🇮🇷 کوشیدن

**خەبتاندن / xebtandin/**: چاوگ. خەبات پێ کردن 🇮🇷 بە کوشش واداشتن

**خەبتین / xebtîn/**: ☜ **خەبتان**

**خەبس / xebs/**: ناو. ١. ئازار؛ ڕەنج ٢. دەسڕەنج؛ ئەوەی بە کار و تێکۆشانی زۆرەوە دەس دەکەوێ 🇮🇷 ١. رنج ٢. دسترنج

**خەبسین / xebsîn/**: چاوگ. پەشێو بوون؛ شێویان؛ سەر لێ شێوان 🇮🇷 آشفتن

**خەبەر[1] / xeber/**: ناو. خەوەر: ١. هەواڵ؛ نووچە؛ دەنگ‌وباس ٢. جنێو؛ سخێف ٣. گفت؛ قسیە ٤. ئاگایی ‹ئیسە بوول دەرد کەرۆ بە سەردا/ دەک سلامەت بای چیت ئی خەبەر دا «مەولەوی»› 🇮🇷 ١. خبر ٢. دُشنام ٣. سُخن ٤. آگاهی

◘ **خەبەر پێ دان**: ئاگادار کردن 🇮🇷 آگاه کردن

**خەبەر دان**: خەوەر دان: ١. ڕاگەیاندن ٢. ئاشکرا کردنی قسە و باسی نهێنی 🇮🇷 ١. گزارش دادن ٢. برملا کردن

**خەبەر[2]**: ئاوەڵناو. خەوەر؛ نەخەوتوو 🇮🇷 بیدار

◘ **خەبەر بوونەوە**: لە خەو هەستان؛ بێدار بوونەوە. هەروەها: **خەبەر کردنەوە** 🇮🇷 از خواب برخاستن

**وە خەبەر هاتن**: هەڵسان 🇮🇷 بیدار شدن

**خەبەربەر / xeberber/**: ناو. وەڵامبەر 🇮🇷 پیک

**خەبەربەزێن / xeberbezên/**: ناو. شووفار؛ زوانگیر؛ جاسووس؛ سیخوڕ 🇮🇷 جاسوس

**خەبەرپرس / xeberpirs/**: ناو. هەواڵپرس 🇮🇷 جویای خبر

**خەبەردار[1] / xeberdar/**: ئاوەڵناو. خەوەردار؛ بەئاگا؛ های لێ 🇮🇷 مُطلع؛ آگاه

**خەبەردار[2]**: سارستە. خەوەردار؛ وریا بە 🇮🇷 بپا؛ مواظب باش

**خەبەرداری / xeberdarî/**: ناو. تەڤلی؛ های؛ ئاگاداری 🇮🇷 آگاهی

**خەبەردۆخ / xeberdox/**: ناو. وتەبێژ؛ قسەکەر لە جیاتی کەسانی تر 🇮🇷 سخنگو

**خەبەردەر / xeberder/**: ناو. هەواڵنێر؛ هەواڵدەر 🇮🇷 خبرنگار

**خەبەردیلە / xeberdîle/**: ناو. کرێژەبەرد؛ خەنەگورگە؛ بەڵخ کوچک 🇮🇷 گُلسنگ

**خەبەرگوهێز / xeberguhêz/**: ناو. قسەڕاگوێز 🇮🇷 سخن‌چین

**خەبەرۆشک / xeberoşk/**: ناو. نەزیلە؛ چیرۆک 🇮🇷 داستان

**خەبەرهێن / xeberhên/**: ناو. پەیامهێن؛ کەسێک

ولامێک دەهێنێ 🇮🇷 پیام‌آور

**خەبەنگ** / xebeng/: ناو. ١. سەربانی لە رووکێش و تەنەکە ٢. ☜ **خەربەند** 🇮🇷 ١. بام شیروانی ٢. ☜ **خەربەند**

**خەبینەت** / xebînet/: سارستە. مخابن؛ حەیف؛ داخەکەم؛ بە داخەوە 🇮🇷 دریغا

**خەپ** / xep/: ناو. *[منداڵانە]* حەپ؛ حەم؛ کاری قووت دان لە زمانی منداڵاندا 🇮🇷 عمل خوردن در زبان بچەها

**خەپار** / xepar/: ناو. ١. باری خۆش بوونی کێڵگە بۆ چاندن ٢. بژار 🇮🇷 ١. آمادە شدن زمین برای کشت ٢. وجین

**خەپان** / xepan/: ناوەڵناو. خەپە؛ خەپەتۆڵە 🇮🇷 تُپل

**خەپخەپێن** / xepxepên/: ناو. یارییەکی لاوانی گوندنشینە، شەوانە لە کۆڕەکەیاندا چرا دەکوژێننەوە، هەر کەس مست بۆ کەسێک دادێنێتەوە، جا هەر کەس وریا بێ خۆی لا دەدا مستەکەی بەر نەکەوێ 🇮🇷 از بازی‌های جوانان

**خەپر** / xepr/: ناو. وەرد؛ کاری دووبارە کێلان 🇮🇷 شخم دوبارە

**خەپراندن** / xeprandin/: چاوگ. ١. وەرد دانەوە ٢. چینە کردنی باڵندە ٣. بە پەلە خواردن 🇮🇷 ١. دوبارە شخم زدن ٢. چینە کردن ٣. بلعیدن

**خەپرە** / xepre/: ناو. ١. پەپکە؛ پاپۆکە؛ لێک‌هالانی بە ئاڵقە ٢. کاری سەر نانە ناو دەست و نووستن 🇮🇷 ١. چنبرە ٢. عمل سر میان دست گذاشتن و خوابیدن

**خەپشە** / xepşe/: ناو. *[شوورەیی]* خەپلە؛ کوز؛ شەرمی ژن 🇮🇷 عضو تناسلی زن

**خەپک** / xep(i)k/: ناو. ١. داو؛ تەڵە ٢. کولێرەی هەرزن 🇮🇷 ١. تلە ٢. گردەی ارزن

**خەپکە** / xepke/: ناو. ئاڵقە؛ گەو 🇮🇷 حلقە

**خەپلە**[1] / xeple/: ناو. ١. کولێرەی ئەستوور ٢. کولێرە لە هەرزن ٣. *[شوورەیی]* خەپشە؛ کوز؛ شەرمی ژن 🇮🇷 ١. گردەی پهن و کلفت ٢. گردەی ارزن ٣. عضو تناسلی زن

**خەپلە**[2]: ناوەڵناو. ١. گێلۆکەی نازیرەک ٢. کورتەباڵای قەڵەو 🇮🇷 ١. کودن ٢. تُپل

**خەپلەخڕێ** / xeplex(i)řê/: ناو. کایە و دەست‌بازی ژن و مێرد و یەکتر تلاندنەوە 🇮🇷 غلت زدن زن و شوهر

**خەپۆڵە** / xepoła/: ناو. کولێرە 🇮🇷 گردە نان

**خەپووڵی** / xepûłî/: ناوەڵناو. پووڵپەرست؛ پارەخۆشەویست 🇮🇷 پول‌پرست

**خەپە** / xepe/: ناو. ١. درمغ؛ دارێکی بەددانە، کڵۆشی پێ کۆ دەکەنەوە ٢. هەپە؛ کەرکیت؛ شانەی تەون کوتان 🇮🇷 ١. از ابزار کشاورزی ٢. شانەی قالیبافی

**خەپەتۆڵە** / xepetołe/: ناوەڵناو. خرپنە و قەڵەو 🇮🇷 تُپل

**خەپەخان** / xepexan/: ناوەڵناو. شەڵتان؛ خەڵتان 🇮🇷 آغشتە

⊡ **خەپەخان کردن**: شەڵتانی شتێ کردن ‹خەپەخانی کرد لە خوێن› 🇮🇷 آغشتن

**خەپەخەپ** / xepexep/: ناو. کار و ڕەوتی تلاوتل ڕۆیشتنی منداڵ 🇮🇷 تاتی ـ تاتی

**خەپەرە**[1] / xepere/: ناو. دۆخی خڕ بوونەوەی چوارپەلی حەیوان (سەگ و پشیلە و ...) لە خەودا. هەروەها: **خەپەرە کردن** 🇮🇷 حالت جمع شدن دست و پای حیوان هنگام خواب

**خەپەرە**[2]: ☜ **خرپن**

**خەپەڵە** / xepełe/: ☜ **خرپن**

**خەت** / xet/: ناو. ١. کێڕ؛ باریکەیەک، شوێنی قەڵەم لە سەر قاقەز ٢. ئەلفوبێ؛ شیک؛ تێکڕای ئەو نیشانانە کە وشە و ڕستەی زمانێکی پێ دەنووسرێ ‹خەتی کوردی؛ خەتی چینی› ٣.

دەسنووس؛ قاغەز؛ نووسراوە؛ بەڵگە؛ نامە ‹بچۆ لای سەرۆکەوە، خەتێ بێنە!› ٤. شێوەی نووسینی ئەلفوبێی زمانێ ‹خەتی نەستەعلیق؛ خەتی جوان› ٥. هێڵ ٦. دێڕ ٧. *[مەجاز]* مووی تازە لە رووی لاو دەرهاتوو ٨. هێڵی جووت ٩. دیوێ لە سکە وا نرخەکەی بە ژمارە لە سەر نووسراوە 🇮🇷 ١تا ٥. خط ٦ سطر ٧. موی تازه برآمده‌ی صورت نوجوان ٨. شیارهای زمین شخم‌زده ٩. روی خط سکه

⊡ **خەت دان** ١. هێڵ لێدان؛ خەت لێدانی زەوی ٢. شت نووسین ٣. موو لە روو هاتنی تازەلاو 🇮🇷 ١. شخم زدن زمین ٢. نوشتن ٣. برآمدن مو بر صورت نوجوان

**خەت کێشان** ١. خەت پێدا هێنان ٢. شوێن و کار و بار بۆ دیاری کردن ٣. وە لا نان؛ کار پێ نەمان 🇮🇷 ١. خط کشیدن ٢. نقشه‌ی کاری را کشیدن ٣. حذف کردن

**خەتا** / xeta/: ناو. هەڵە؛ سووچ؛ تاوان 🇮🇷 خطا

**خەتابار** / xetabar/: ئاوەڵناو. تاوانبار. هەروەها: **خەتاباری** 🇮🇷 خاطی

**خەتات** / xetat/: ناو. ١. وەسمەی برۆ؛ خەنە و رەنگێ کە لە برۆ دەدرێ ٢. گوندەنووس؛ خۆش‌نووس 🇮🇷 ١. وسمه ٢. خوشنویس

**خەتاتی** / xetatî/: ناو. گوندەنووسی؛ خۆش‌نووسی 🇮🇷 خوشنویسی

**خەتاکار** / xetakar/: ئاوەڵناو. تاوانبار. هەروەها: **خەتاکاری** 🇮🇷 خاطی

**خەتبازی** / xetbazî/: ناو. شەشخان؛ شەشخانە؛ یارییەکی مندالانەیە بە لەتەسواڵەتێک یان بەردێکی تەخت لە سەر زەوی دەکرێ 🇮🇷 لی‌لی

**خەتبەچۆزێ** / xetbeçozê/: ناو. ناوی یارییەکە 🇮🇷 از بازی‌ها

**خەتخۆش** / xetxoş/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی کەسێ کە جوان دەنووسێ 🇮🇷 خوش‌خط

**خەت ـ خەت** / xet xet/: ئاوەڵناو. رێ ـ رێ؛ خەتدار 🇮🇷 راه ـ راه

**خەتخەتێن** / xetxetên/: ناو. ناوی کایەیەکە 🇮🇷 از بازی‌ها

**خەتدار** / xetdar/: ☜ **خەت ـ خەت**

**خەتسین** / xetsîn/: چاوگ. خنکان 🇮🇷 خفه شدن

**خەتکوورەوکەر** / xetkûrewker/: ناو. مەساحە؛ میدادسر 🇮🇷 مدادپاک‌کن

**خەتکەش** / xetkeş/: ☜ **خەتکێش**

**خەتکێش** / xetkêş/: ناو. خەتکەش؛ راستە؛ ئامرازی خەتی راست کێشان 🇮🇷 خط‌کش

**خەتمی**[1] / xetmî/: ناو. هێرۆ؛ گوڵەهەرمەڵە 🇮🇷 ختمی

**خەتمی**[2]: ئاوەڵناو. یاغی؛ سەربزێو؛ دژی قانوون 🇮🇷 یاغی

**خەتن** / xet(i)n/: ☜ **خەتەنە**

**خەتنە** / xetne/: ☜ **خەتەنە**

**خەتوخاڵ** / xet û xał/: ناو. نەخش و نیگاری بەر چاوی گیانداران ‹وێت مەدە بە دەست خوردەی خەت‌وخال/ خەیاڵ مەکەرۆت بە کۆگای زوخاڵ «بێسارانی»› 🇮🇷 خطوخال

**خەتەر** / xeter/: ئاوەڵناو. هەتەر، مەترسی؛ ئەگەری هەبوونی زیان ‹فەقری خۆمم چاکە بە ئاسان تەی دەکەم رێگەی روین/ کۆلی سەنگین و سەفەر، رێگەی خەتەر من نامەوێ «شەمسی قورەیشی»› 🇮🇷 خطر

**خەتەنە** / xetene/: ناو. سوننەت؛ خەتنە؛ خێتەنە؛ خەتن؛ کاری برین و هەڵگرتنی پێستی سەر چووکی مرۆی نێرینە 🇮🇷 ختنه

**خەتەنەسوران** / xetenesûran/: ناو. نان خەتەنە؛ بەزم و بانگێشتن بە هۆی خەتەنە کردنی کوڕێژگانەوە 🇮🇷 ختنه‌سوران

**خەتیرە** / xetîre/: ناو. چۆڵەچرا؛ چلووسک؛

چلۆسک ☰ نیمسوز

**خەجاڵەت** / xecałet/: ئاوەڵناو. شـەرمەزار ‹باوکـت خەجالەت، دایکت ڕووسیا/ تۆیان لە من کرد بۆ مالّی دنیا «فولکلۆر»› ☰ شرمنده

⊡ **خەجاڵەت بوون/ بوونەوە**: شـەرمەزار بـوون ‹بۆ حەلاڵە مالّی کورد و بۆچی فەرزە کوشتنی؟/ دەک خەجالـەت بـێ درۆزن! چـۆن وەهـا پـیلان ئـەکا قانع»› ☰ شرمنده شدن

**خەجاڵەت کردن**: شـەرمەزار کـردن ☰ شـرمنده کردن

**خەجاڵەتبار** / xecałetbar/: ئاوەڵناو. شـەرمەزار ☰ شرمسار

**خەجاڵـەتباری** / xecałetbarî/: نـاو. تـــەریقی؛ تەریقی؛ ملشۆڕی ☰ شرمندگی

**خەجاڵەتی** / xecałetî/: نـاو. ١. شوورەیی؛ عـەیب ٢. شەرمەزاری ☰ ١. عیب و عار ٢. شرمندگی

⊡ **خەجاڵـەتی کێشان**: هەسـت بـە شـەرمەزاری کردن ☰ خجالت کشیدن

**خەجخەجک** / xecxecik/: ☜ **خەجیجۆک**

**خەجخەجۆک** / xecxecok/: ناو. ١. جۆرێ بۆق کـە هەمیشە لە ئاودایە ٢. جۆرێ مارمێلکەیە دەلـێن لە ئاگردا ناسووتێ ☰ ١. نـوعی قورباغـە کـە از آب بیرون نمی‌آید ٢. سمندر

**خەجڵ** / xecił/: ئاوەڵـناو. خەریک؛ سـەرقاڵ ‹ئەمـە خەجل چەی؟› ☰ سرگرم؛ مشغول

**خەجلان** / xecłan/: ☜ **خەجلین**

**خـەجلین** / xecłîn/: چـاوگ. خـەجلان؛ شلـەژان؛ داچڵەکین ☰ یکە خوردن

**خەجەرۆ** / xecero/: ناو. خواجارۆ؛ نـاوی یارییەکـە ☰ از بازی‌ها

**خـەجیجۆک** / xecîcok/: ناو. خەجخەجک؛ گیایەکە گوڵی سووری پیاڵەیی دەکا ☰ گیاهی با گل‌هـای قرمز

**خەدامـە** / xedame/: نـاو. کارەکـەر؛ کلـفەت؛ قەرەواش؛ ژنی خزمەتکار ☰ کُلفَت؛ خدمتکار

**خەدە** / xede/: ☜ **خدە**

**خـەدەنگ** / xedeng/: نـاو. تـیر ‹نـالی وەرە لادە لـە خەدەنگی مـوژەیـی یـار/ ئـەو کـافرە مـەسـتانە، کـە غارەتگەری دینن «نالی»› ☰ تیر

**خەر**[١] / xer/: ناو. کەر؛ ولاخ؛ گوێدرێژ ☰ خر

• **خەر**[٢]: پاشەوشە. ١. تووڕدەر؛ هـاوێژەر ‹بەردخـەر› ٢. خستنە باریکەوە ‹ڕێکخەر؛ تێکخـەر؛ سـەرخەر› ٣. پان‌کەرەوە ‹ژێرەخەر› ☰ ١و ٢. انداز ٣. ـ گُستر

**خەرا** / xera/: ☜ **خەراب**

**خەراب** / xerab/: ئاوەڵناو. خەرا؛ خەراو؛ خـراوە: ١. نەباش ٢. وێران ٣. لەکارکەوتە ☰ ١. بد ٢. ویـران ٣. تباه

**خەرابە** / xerabe/: ناو. وێرانە؛ کەلاوە ☰ ویرانه

**خەراج** / xerac/: ناو. مالیات؛ پیتاک؛ بەرج؛ خاراج؛ خووە؛ خووێک ☰ مالیات

**خەرار** / xerar/: ناو. خەشـە؛ جەوالـی لـە مـوو ☰ غراره

**خـەراف** / xeraf/: نـاو. تـۆڕی ماسـیگیری ☰ تـور ماهیگیری

**خەرامان**[١] / xeraman/: ناو. لەنجە و لار ☰ خرام

**خەرامان**[٢]: ئاوەڵناو. خرامان: ١. جوان ‹ئەسرین جـە دیدەی خەرامان تۆ/ جە سەر بتکیۆ بگنـۆم وە گلـکۆ «بێسـارانی»› ٢. نـازدار ‹چـاوی هەڵـبڕی سەولـی خـــەرامان/ یاخـــەی کـــردەوە ســـەر تـــا بـــە دامـــان «بێسارانی»› ٣. لەبار ‹سەر هۆر دەر نە خاک سەوڵ خەرامان!/ من مەجنوون تۆم بـەی تـەور پـێم ئامـان «خالۆی کۆماسی»› ٤. خـۆش‌ڕەوت ☰ ١. زیبـا ٢. نازنین ٣. خوش‌قواره ۴. طناز

**خـەرامان**[٣]: ئاوەڵـکار. خرامـــان؛ بەلەنجـــەولار؛ بەلارولەنجە ☰ خرامان

**خەراو**[١] / xeraw/: ناو. جوێن؛ سخێف ☰ دشنام

▣ **خەراو وتن**: جوێن دان؛ دژمان دایــن؛ ســخێف گوتن ☰ دشنام دادن

**خەراو**[٢]: ☜ **خەراب**

**خەراووێژی / xerawwêjî**/: ناو. قسەی خەراو وتــن ☰ فحاشی

**خەراوە / xerawe**/: ☜ **خراپە**

**خەراوەکار / xerawekar**/: ناو. خەراوەکەر؛ چەتــە؛ دز؛ ڕێگر ☰ راهزن

**خەراوەکەر / xeraweker**/: ☜ **خەراوەکار**

**خەراوی / xerawî**/: ☜ **خراپی**

**خەربار / xerbar**/: ناو. ١. بــاری کــەر ٢. خــەروار؛ خەڵوار؛ کێشێکە بەرانبەر بە سێســەد کیلــۆ ☰ ١. بار الاغ ٢. خروار

**خەربەند / xerbend**/: نــاو. خەربــەنگ؛ خــەروەن؛ خەبــەنگ؛ خەرەبــەنگ؛ غەربــەنگ؛ منگــەگیا؛ گوڵــەلێوە؛ گیایەکــە بــەرێکی ورد وەک تــۆم خەشخاشی هەیە ☰ خربق سیاه

**خەربەندە / xerbende**/: نــاو. کــەردار؛ وڵاخــدار؛ ئاگاداری بارەبەران ☰ چاروادار

**خەربەنگ / xerbeng**/: ☜ **خەربەند**

**خەرپشت / xerpişt**/: نــاو. ١. کۆلکــەی گــەورە بــۆ دەرگا داخستن ٢. میچ و بانی لە خشت و بە تاق ☰ ١. کُندە کە پشت در نهند ٢. خرپُشتە؛ بام خشتی طاق نما

**خەرپشتە / xerpişte**/: ناو. خەرپشــت؛ میچــی بــە خشت ☰ خرپُشتە

**خەرپنگ / xerping**/: نــاو. خــەرپونگ؛ خەرپونگــە؛ زرەپنگ؛ پنگەی دەم ئاوی پیس ☰ نوعی پونــەی وحشی

**خەرپونگ / xerpung**/: ☜ **خەرپنگ**

**خەرپونگە / xerpunge**/: ☜ **خەرپنگ**

**خەرت / xert**/: ناو. ١. ئاژەڵی دابەستە ٢. بــەران و نێــری چوارساڵــە و بــەرەوژوور ٣. ئــامرازی دار لووس کردن؛ ئامرازی خەڕات ☰ ١. بختە ٢. شاک و قوچ چهار سالە بە بالا ٣. ابزار خراطی

**خەرتا / xerta**/: ناو. تێری زیخ و ڕەڵم کێشــان ☰ جوال ریگ‌کشی

**خەرتاڵ / xertal**/: ☜ **خەرتەل ـ١**

**خەرتاندن / xertandin**/: چاوگ. ڕنین؛ لە خــەرت دان؛ لووس کردن؛ کڕاندن ☰ خراطی کردن

**خەرتل / xertil**/: ☜ **خەرتەل ـ١**

**خەرتۆک / xertok**/: ناو. خرتک؛ پاشەڕۆک؛ مێوەی بەجێ‌مــاو لــە دار کــە لــە بــەر کاڵــی و نادیــاری نەچنرابێ ☰ پساچین

**خەرتۆڵە / xertołe**/: ئاوەڵناو. خــرپن و جوانکەلــە (مندال و بێچوەســەگ) ☰ تُپــل و زیبــا (بچــه و تولــه سگ)

**خەرتــە / xerte**/: نــاو. ١. کــار و ڕەوتی کــێڵانی وشکەزەوی دووەرە باران ٢. وەرد؛ کاری دیسانەوە کێڵان ☰ ١. شخم زمین خشــک و ســفت ٢. شــخم دوبارە

**خەرتــەل / xertel**/: نــاو. ١. خرتــەل؛ خــەرتل؛ خــەرتاڵ؛ خرتــل؛ خــەردال؛ دالاش؛ ســوورەدال؛ هولیلــک؛ دال؛ لەشــخۆر؛ لاشــخۆر؛ کــەرخۆر؛ کــــەرخوەر؛ دالـــــەکەرخۆر؛ دالـــــەکەرخوەرە؛ مردالخوەر؛ شانەکووڕە؛ باڵــندەیەکە لــە خێــزانی دالاشەکان سەر بــە تۆرەمــەی هەڵــۆ، نزیــک لــە میترێــک دەبــێ، باڵــی پــان و درێــژە، کلکــی چوارسووچی کورت و ئاماڵڕەشە، سەری کورت و ملــی رووتــە، بــە گــەل دەبینــرێ، بــە گــەل لــە ئەشکەوت و سەر تاتەبەردی کوێســتانان هێلانــە ســاز دەکــا ٢. ☜ **خــەرتــەلــە** ☰ ١. دال ٢. ☜ **خەرتەلە**

**خەرتەلــە / xertele**/: نــاو. خەردالــە؛ خەردالــە؛ خــەردەل؛ خەرتــەل؛ خەنــدەلک؛ غەردەل؛ شێلمۆک؛ گیایەکی ئالیکی یەکســالان

لە تیرەی ئیسیوەت و ئالات، چەن جۆری سپی و ڕەش و کێوی هەیە. هێندێ تونـدە و وەک تـام لەگەڵ خۆراکی دەکەن ✉ خردل

**خـەرتین / xertîn/:** چـاوگ. لـە خـەرت دران؛ کردران ✉ خراطی شدن

**خەرج / xerc/:** ناو. ١. بـەخت؛ باخـت ٢. بـاجی دەوڵەت ٣. دراوێ کە ڕەشایی دەیـدا بـە ئاغـای دێ لە باتی خانووەکەی ✉ ١. خـرج ٢. مالیـات ٣. کرایه خانەای که کشاورز به مالک ده میپرداخت

◻ **خەرج بوون** مەزاخت بوون ‹هەرچی پارەم هەبوو بە ڕێگەدا خەرج بوو› ✉ خرج شدن

**خەرج دان** نان دان؛ بۆ پاداش و لـێبـوردوویی خێر و خێرات کردن ✉ خرج دادن

**خەرج دانە دەسەوە** خـەرج نانـە سـەر دەسـت؛ خـەرج کردنـە ڕیشـەوە؛ ناچـار کـردن بـە مەزخانـدنی پارەیـەک ✉ خـرج روی دسـت گذاشتن

**خەرج دەرچوون** تێچـوون؛ خـەرج بـوون ‹بـۆ کردنەوەی ئەم ماڵە چەندت خەرج دەرچوو؟› ✉ هزینه شدن

**خەرج کردن** مەزخاندن؛ بەخت/ باخـت کـردن؛ مەزاختن ✉ خرج کردن

**خەرج هەڵگرتن** خـەرج تێچـوون؛ تێچـوون ‹میوانییەکەی دوێنێ خەرجی زۆری هەڵگرت› ✉ خرج برداشتن/ داشتن

**خـەرجی خـۆ دەرهێنـان** ١. پـووڵ و پـارەی هەڵسووڕانی ژیانی خـۆ دابـین کـردن ‹کـوڕە گەورەکەم خەرجی خـۆی دەردێنـێ› ٢. پـارەی دەکار چوو لە کاتی فرۆشـدا هێنانـەوە ‹ئەگـەر ئەم ماڵە بفرۆشم، خەرجی خـۆی دەرناهێنێتـەوە› ✉ ١و٢. خرج خود را درآوردن

**خـەرجکراو / xerck(i)raw/:** ئاوەڵـناو. تێچـوو؛ بەختکراو ✉ هزینەشده

**خـەرج و دەخڵ / xerc û dexł/:** نـاو. دەخـڵ و خەرج؛ داهات و داچوو؛ داهات و خەرج ✉ دخل و خرج

**خـەرجی[1] / xercî/:** نـاو. ١. خـەرجی ڕۆژانـە ٢. گۆبـەرۆک ✉ ١. مصـرف و خـرج روزانـە ٢. زیـور کنارەی یَلَک

**خەرجی[2]:** ئاوەڵـناو. هـەموانی ‹نـانی خـەرجی› ✉ عمومی

**خـەرخودا / xerxuda/:** نـاو. ١. جاڵجاڵـووکە؛ داوتەنە؛ جاوتەنە؛ کاکڵەمووشان ٢. کەرەکەوڵە ✉ ١. عنکبوت ٢. خرخاکی

**خەرخەشە / xerxeşe/:** نـاو. ١. کێشـە و هـەرا؛ قەرقەش ٢. جقجقە؛ شەقشەقە ✉ ١. کشمکش و نزاع ٢. جغجغە

**خەردار / xerdar/:** ناو. دوو دار لە ئاشدا کە لە بـن داری ژێر بەرداشدان ✉ دو چوب زیر حامـل سـنگ آسیا

**خەردالە / xerdale/:** ☜ خەرتەلە

**خەرداڵ / xerdał/:** ☜ خەرتەل ـ١

**خەرداڵە / xerdałe/:** ☜ خەرتەلە

**خـەرداو / xerdaw/:** نـاو. زەرداو؛ زەرتـاڵ؛ تـاڵاو؛ سەفرا ✉ صفرا

**خەردەل / xerdel/:** ☜ خەرتەلە

**خەردەڵ / xerdeł/:** ☜ خەرتەلە

**خەرز / xerz/:** ناو. ١. کاری جـووت بـوونی نێـر و مێیی جانەوەران، جگە لە مرۆ ٢. گـەرای مێـروو (وەک: کولە، مێرووله و ...) ✉ ١. جفتگیری حیوانات ٢. تخم حشرات

**خەرزڕ / xerziř/:** ناو. زنجیری لێخوڕینی وڵاخـدار ✉ زنجیر راندن ستور

**خـەرس / xers/:** نـاو. قـەرس؛ خـەمڵ؛ بـەراورد ✉ تخمین؛ برآورد

◻ **خەرس کردن** قەرساندن ✉ تخمین زدن

**خەرساندن / xersandin/:** ☜ **خەساندن**

**خەرسانن / xersanin/:** چاوگ. ۱. قەرساندن؛ بەراورد کردن ۲. ☜ **خەساندن** ⚑ ۱. برآورد کردن ۲. ☜ **خەساندن**

**خەرسەخول / xersexul/:** ☜ **قەرسەقول**

**خەرسەقول / xersequl/:** ☜ **قەرسەقول**

**خەرسەک / xersek/:** ناو. ۱. خرسەک؛ مافوورەی بەکولکە ۲. کولێرەی ئەستوور ۳. کلۆ؛ گلی بەتۆپەڵی وشکەوە بوو ⚑ ۱. قالی پرپشت ۲. گردەی کلفت ۳. کلوخ

**خەرشۆڤ / xerşov/:** ئاوەڵناو. نابابەت بۆ کێڵان (بۆ زەوی) ⚑ نامناسب برای کشاورزی (زمین)

**خەرشەب / xerşeb/:** ناو. ئەسکوێ؛ ئەسکوو؛ قوڵەغە؛ کەوچکی زەلامی کلکدرێژ ⚑ ملاغه

**خەرف / xerf/:** ☜ **خەرفاو**

**خەرفان / xerfan/:** ☜ **خەرەفان**

**خەرفاو / xerfaw/:** ئاوەڵناو. خەرف؛ خەرفتی؛ خەرفی؛ خەرفیو؛ خەرەفی؛ خورفی؛ خەرەف؛ غورفی؛ هورفی؛ لە بەر پیری هۆش نەماو ‹ئاخۆ نالێن عەبدولعەزیز پیرە، خەرفاوە و پیاوێکی ئاخرشەڕە؟ «سوارە»› ⚑ خرفت

**خەرفتی / xeriftî/:** ☜ **خەرفاو**

**خەرفی / xerfî/:** ☜ **خەرفاو**

**خەرفیان / xerfyan/:** ☜ **خەرەفان**

**خەرفین / xerfîn/:** ☜ **خەرەفان**

**خەرفیو / xerfîw/:** ☜ **خەرفاو**

**خەرقە / xerqe/:** ناو. بالاپۆشی دەروێشان ⚑ خرقه

**خەرقین / xerqîn/:** چاوگ. شەمتین؛ خلیسکان ⚑ لیز خوردن

**خەرک / xer(i)k/:** ناو. خەرەک: ۱. داری درێژی سێ پێچک کە تاوانباری لە سەر بەر قامچی دەدەن ۲. دوو تای دارین کە لە سەر پشتی باربەر دادەنرێ بۆ بەرد کێشان ⚑ ۱. سەپایەی فلک ۲. چوب دوسری که بر پشت باربر برای حمل سنگ گذارند

**خەرکان / xerkan/:** ☜ **خرکانە**

**خەرکانە / xerkane/:** ☜ **خرکانە**

**خەرکاو / xerkaw/:** ئاوەڵناو. خەریک؛ سەرقاڵ ‹دیارە ئەسیری بێناف و دوودەی/ بۆیە هەر خەرکاو قسەی بێهوودەی «مەستوورە»› ⚑ مشغول؛ سرگرم

**خەرکنج / xerkinc/:** ناو. قرژانگ؛ قرژاڵ ⚑ خرچنگ

**خەرکۆڵ / xerkoł/:** ناو. کەرکۆڵ؛ گیایەکی سەرزلی بەدڕکە ⚑ گیاهی خاردار

**خەرکووز / xerkûz/:** ناو. گیایەکی خۆڕسکە، لە ٤٠ تا ۱۰۰ سانتیمیتر بەرز دەبێ گوڵی چەتری و هێشوویی دەکا ⚑ شقاقل جویباری

**خەرکەمان / xerkeman/:** ناو. خەرکەوان؛ ئامرازی چەماندنەوەی کەللەبێژنگ و کەمەی دەف ⚑ وسیلەی خم کردن چنبر غربال و دف

**خەرکەوان / xerkewan/:** ☜ **خەرکەمان**

**خەرگا / xerga/:** ناو. خێوەتی زۆر گەورەی پیاوی گەورە ⚑ خرگاه

**خەرگۆڕ / xergoř/:** ناو. خەرگۆلک؛ گوڕ؛ کەرەکێوی ⚑ گورخر

**خەرگۆلک / xergolik/:** ☜ **خەرگۆڕ**

**خەرگە / xerge/:** ناو. ۱. پەڕۆی کۆن و پیس ۲. دۆشەکی ئەستوور و گەورە لە پەڕۆپاڵی کۆن ⚑ ۱. لته پارچەی کهنه و کثیف ۲. تشک بزرگ و کلفت از پارچه و لباس کهنه

**خەرگەلە / xergele/:** ناو. ۱. کەرلەوەڕێن ۲. *[پلار]* مرۆی پیس و پۆخڵ و کۆنەپۆش ⚑ ۱. خرچران ۲. آدم کثیف

**خەرمان / xerman/:** ناو. ۱. خرمان؛ بێدەر؛ کۆمای گەنم و دانەوێڵە پاش دووران ‹بەلام چبکەم، چارەڕەشم/ خەرمانم زۆرە و بێبەشم «مەلا ئاوارە»›

٢. /مەجاز/ کۆمای هەر شتێک ‹خەرمان خەمان ها وە کەل باوە/ شەنکەر یەکێکە دووشەن وە لاوە «مەولەوی»› ٣. خەرمانە؛ مژی دەوری مانگ ☰ ١. خرمن ٢. توده ٣. هاله

▣ **خەرمان پێوان**: بێدەر بە کیلە وەرگەڕاندن ☰ پیمانه کردن خرمن با کیل

**خەرمان سور بون**: دان لە کا جویێ بوونەوە لەو کاتەوە کە زۆرینەی کاکەی دەردەچێ ☰ پاک و آماده شدن خرمن

**خەرمان کوتان**: خەلە کوتان؛ خەرمان هەڕین؛ لێکردنەوەی دەخڵ و دان لە پووش و کڵۆش بە خەرمانکوت ☰ خرمن کوبیدن

**خەرمان هەڵگرتن**: خەرمان پێوان و بردنەوەی بۆ ماڵ ☰ خرمن برداشتن

**خەرمانان** / xermanan/: ناو. ١. مشتاخان؛ شاریوەر؛ تەباخ؛ یەرمین؛ مانگی شەشەمی ساڵی ئێرانی، ئاخر مانگی هاوین کە ٣١ ڕۆژە ٢. ناوخەرمان؛ جەنگەی خەرمان هەڵگرتن ☰ ١. شهریور ٢. موسم برداشت محصول

**خەرماناوا** / xermanawa/: دوعا. خەرمان زیاد؛ خەرمانبەرەکەت؛ پیت بۆ خەرمان ☰ دعای برکتدار شدن خرمن

**خەرمانبەرەکەت**[1] / xermanbereket/: ناو. بەخششێ کە خاوەن خەرمان ئەیدا ☰ بخشش صاحب خرمن

**خەرمانبەرەکەت**[2]: ☜ **خەرماناوا**

**خەرمانپێو** / xermanpêw/: ناو. کەسێ کە خەرمان بە کیلە دەپێوێ ☰ خرمن کیل

**خەرمانزیاد** / xermanz(i)yad/: ☜ **خەرماناوا**

**خەرمانسور** / xermansûr/: ناو. ١. کۆ گەنمی خەرمان ٢. وەختی خەرمانان ☰ ١. راش ٢. موسم برداشتن خرمن

**خەرمانسورانە** / xermansûrane/: ناو. خەرمانەسووران؛ بانگێشتن بە هۆی سوور بوونی خەرمانەوە ☰ جشن و سور آماده شدن خرمن

**خەرمانکوب** / xermankûb/: ☜ **جەنجەڕ-٢**

**خەرمانگا** / xermanga/: ناو. جێ خەرمان؛ شوێنێ کە وەرزێران خەلە و خەرمانی خۆیانی تێدا کۆ دەکەنەوە ☰ خرمنگاه

**خەرمانلۆخانە** / xermanloxane/: ناو. خەرمانلۆغە؛ خەرمانلۆخە؛ خەرمانلۆگانە؛ خرمانلۆغە؛ شیرنی خەرمان سوور بوون ☰ سور آماده شدن خرمن

**خەرمانلۆخە** / xermanloxe/: ☜ **خەرمانلۆخانە**

**خەرمانلۆغە** / xermanloğe/: ☜ **خەرمانلۆخانە**

**خەرمانلۆگانە** / xermanlogane/: ☜ **خەرمانلۆخانە**

**خەرمانە** / xermane/: ناو. ١. خرمان؛ ئاخڵ؛ ئاخڵە؛ جۆخینە؛ جووخینکە؛ تەم و مژێ دەورە مانگ، خۆر و هەسارەی ڕاخووشاو کە لە بەر چاو وەک کەمەیەکە ٢. کەمەی ڕووناکایی لە دەوری شتێک ☰ ١و٢. هاله

▣ **خەرمانە دان**: تەم و مژ دەوری مانگ و ... گرتن ‹حەو جار بەو مانگەی خەرمانەی داوە/ هێشتا مەیلی تۆم بە کەس نەداوە «فولکلۆر»› ☰ هاله فراگرفتن ماه و ...

**خەرمانەستێر** / xermanes(i)têr/: ناو. کۆتەرازوو؛ پۆلێکئەستێرە ☰ خوشەی پروین

**خەرمانەسووران** / xermanesûran/: ☜ **خەرمانسورانە**

**خەرمانەوان** / xermanewan/: ناو. پاسەوانی خەرمان ☰ خرمنپا

**خەرمشک** / xermişk/: ناو. جرج؛ مشکەکوێرە ☰ موش کور

**خەرمووڕگ** / xermûrig/: ناو. گژک؛ گژی؛ کوژەکە؛ کووژەکە؛ کوڕژا؛ مووڕا؛ موورەکە؛ مۆرەکە؛ خەرمووک؛ مووروەکەرانە؛ کووژەکەرانە؛

موورگەکەوڵە؛ موورگەکەوەڵە؛ مووروویی درشت و شین، پتر بە کورتانی کەرەوەی دەدروون ✂ خرمُهره

**خەرمووش / xermûş/:** ناو. کولاب؛ چنگورک؛ چەمۆڵە ✂ چنگال

**خەرمەخیل / xermexîl/:** ناو. بەرگاویلکە؛ داک ماکەری باب ئەسپ ✂ قاطری کە مادرش الاغ و پدرش اسب است

**خەرمەک / xermek/:** ناوەڵناو. تەمەڵ؛ تەمبەڵ؛ کەهاڵ ✂ تنبل

**خەرمەگەز / xermegez/:** ناو. کەرمێش؛ کەرەنگێزە؛ مێشەکەرانە؛ مێشەکەران؛ مەلشە؛ مۆزک؛ چیز؛ مۆزەشینە؛ خەرەنگەز؛ خەرەنگەزە؛ خەرەنگێز؛ کەرمۆز؛ گولال؛ گازولک؛ مێشێکی کەسکی گەورەیە بە ئاژەڵەوە ئەدا و ڕاگوێزی نەخۆشی ئاژەڵە بۆ مرۆ ✂ خرمگس

**خەرمێز / xermêz/:** ناو. ١. کەرمێز؛ شوێنێ وڵاخ پێدا میزابێ ٢. [کینایە] چاولێکەری؛ لاسایی خەڵک بێ بیر لێ کردنەوە ✂ ١. محل ادرار الاغ ٢. تقلید محض

**خەرناز / xernaz/:** ناو. [پلار] کەرناز؛ ناز و ئەدای کەسێ کە بۆ ناز کردن ناشێ ✂ ناز شُتُری

**خەروا / xerwa/:** ناو. ١. جۆرێ کولێرەی ناودار کە لە ژێر ژیلەمۆ دەبرژێ ٢. نانەقەیسی و نانەهەنجیر ✂ ١. نوعی گردەی مغزدار ٢. لواشک

**خەروار / xerwar/:** ناو. خەربار؛ کێشێکە بەرانبەر بە سێسەد کیلۆ ✂ خروار

**خەروەن / xerwen/:** ☜ خەربەند

**خەروی / xerwî/:** ☜ خەروێ

**خەروێ / xerwê/:** ناو. خەروی؛ کەروێشک؛ کەورێشک ✂ خرگوش

**خەرۆ / xero/:** ناوەڵناو. ١. لە خۆ بایی؛ غلوور ٢. فریودراو؛ خەڵەتاو ✂ ١. مغرور ٢. فریبخورده

**خەروو / xerû/:** ناو. پاکەمتیار؛ گیایەکە بۆ نەخۆشینی گەڕۆلی بەکەڵکە ✂ خرنوب

**خەرە / xere/:** ناو. دیواری لە وشکەبەرد ✂ دیوار از سنگ بی‌ملات

**خەرەبەنگ / xerebeng/:** ☜ خەربەند

**خەرەزەن / xerezen/:** ناو. خەرەزەنگ؛ غەرەزەنگ؛ قامچی زلی کەڵ ئاژۆتن ✂ نوعی شلاق راندن ستور

**خەرەزەنگ / xerezeng/:** ☜ خەرەزەن

**خەرەف / xeref/:** ☜ خەرفاو

**خەرەفان / xerefan/:** چاوگ. تێنەپەڕ. //خەرەفای؛ دەخەرەفێی؛ بخەرەفێ// خەرفان؛ خەرەفیان؛ خەرفین؛ خەرەفین؛ خەرەفیان؛ خەرفیان؛ خەلەفان؛ خەلەفین؛ خەڵەفین؛ خەڵەفیان؛ لە پیری هۆش نەمان ✂ خرفیدن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: خەرەفاو/ چاوگی نەرێنی: نەخەرەفان

**خەرەفاندن / xerefandin/:** چاوگ. چەوەڕنای؛ هۆش لێ برین ✂ خرفت کردن

**خەرەفاو / xerefaw/:** ناوەڵناو. خەرەفی؛ خەرەفیو؛ خەرەفیاگ؛ خەڵەفیاگ؛ هۆش‌نەماو لە بەر پیری ✂ خرفیده

**خەرەفی / xerefî/:** ☜ خەرەفاو

**خەرەفیاگ / xerefyag/:** ☜ خەرەفاو

**خەرەفیان / xerefyan/:** ☜ خەرەفان

**خەرەفین / xerefîn/:** ☜ خەرەفان

**خەرەفیو / xerefîw/:** ☜ خەرەفاو

**خەرەک / xerek/:** ☜ خەرك

**خەرەکی / xerekî/:** ناو. بەرکێش؛ خەرەکی ✂ وسیلەی حمل سنگ

**خەرەند / xerend/:** ناو. خەندۆر: ١. خەندەک؛ قولکەی درێژی لە زەمین کەندراو ٢. قولکە بۆ کۆ بوونەوەی ئاوی پیس ✂ ١. خندق ٢. پارگین

**خەرەنگەز / xerengez/:** ☜ **خەرمەگەز**

**خەرەنگەزە / xerengeze/:** ☜ **خەرمەگەز**

**خەرەنگێز / xerengêz/:** ☜ **خەرمەگەز**

**خەریب / xerîb/:** ئاوەڵناو. ١. غەریب؛ ئاوارە ٢. بێگانە؛ بیانی ٣. سەیر و سەمەرە ٤. بەڵەنگاز و بێچارە ☰ ١. آوارە ٢. بیگانە ٣. عجیب ۴. بینوا

**خەریبۆک / xerîbok/:** ناو. جۆرێ هەرمێ ☰ نوعی گلابی

**خەریبە / xerîbe/:** ئاوەڵناو. ئاوارە؛ لاوەکی ☰ آوارە

**خەریتە / xerîte/:** ناو. ١. فیشەکدان ٢. نەخشە؛ شکڵی ولاتان و ... لە سەر نەخشە ☰ ١. تیردان ٢. نقشەی جغرافیایی

**خەریک / xerîk/:** ئاوەڵناو. خەریکە؛ سەرقاڵ ‹خەریکی شەشدەری هات و نەهاتم/ خەلاسیم قەت نییە لەم نەردە بێ تۆ «نالی»› ☰ مشغول

▣ **خەریک بوون:** سەرقاڵ بوون؛ خجڵ بوون ☰ مشغول شدن

**خەریک کردن:** سەرقاڵ کردن ☰ مشغول کردن

**خەریکە / xerîke/:** ☜ **خەریك**

**خەریکی / xerîkî/:** ناو. خێ؛ دۆخی خەریک بوون ☰ اشتغال

**خەرین / xerîn/:** چاوگ. پرخاندن؛ پرخانن؛ پرخە کردن ☰ خُرناس کشیدن

**خەریوە / xerîwe/:** ناو. بێگانە؛ بیانی؛ خڵەوە ☰ بیگانە

**خەڕا / xeřa/:** ئاوەڵناو. تیژ؛ تێژ لە چێژەدا ☰ تیز و تُند مزە

**خەڕات / xeřat/:** ناو. خەڕرات؛ دارتاشی دارلووس‌کەر بە ئامرازی تایبەتی ☰ خرّاط

**خەڕاتی / xeřatî/:** ناو. خەڕراتی: ١. پیشەی خەڕاتی ٢. دووکانی خەڕات ☰ ١و ٢. خرّاطی

**خەڕاز / xeřaz/:** ناو. وردەواڵەفرۆش ☰ خرّاز

**خەڕازی / xeřazî/:** ناو. خەڕرازی: ١. پیشەی وردەواڵەفرۆشی ٢. دووکانی وردەواڵەفرۆش ☰ ١و٢. خرّازی

**خەڕتاندن / xeřtandin/:** چاوگ. دەرکێشان لە بن و ڕەگەوە ☰ از ریشە کندن

**خەڕڕا / xeřřa/:** ئاوەڵناو. بریقەدار؛ بەبریقە ☰ درخشان

**خەڕڕات / xeřřat/:** ☜ **خەڕات**

**خەڕڕاتی / xeřřatî/:** ☜ **خەڕاتی**

**خەڕڕازی / xeřřazî/:** ☜ **خەڕازی**

**خەڕڕەمە / xeřřeme/:** ناو. خەڕەم؛ نێرەکەری فەحل ☰ نرەخر گُشن

**خەڕگ / xeřig/:** ناو. قوڕ؛ گڵ؛ خەڕە ☰ گِل

**خەڕگەسەر / xeř(i)geser/:** ئاوەڵناو. [کینایە] بەدبەخت؛ کڵۆڵ؛ قوڕبەسەر ☰ خاک‌برسر

**خەڕناش / xeřnaş/:** ☜ **خمخم**[1]

**خەڕنووک / xeřnûk/:** ناو. خڕنووک؛ بنچکێکی دڕکاوییە، بەرێکی وەک قەزوان دەگرێ ☰ بوتەای خاردار

**خەڕووک / xeřûk/:** ناو. خڕنووک؛ بەرێکی دارمازوو ☰ نوعی ثمر درخت مازوج

**خەڕە[1] / xeře/:** ناو. خەڕی؛ قوڕ؛ حەڕی؛ هەڕ؛ هەڕگ؛ هەڕی ☰ گِل

**خەڕە[2]:** ئاوەڵناو. لووتبەرز؛ لووتبڵند؛ لەخۆبایی؛ بەفیز ‹بە بەین و بەقاش هیچ مەبە خەڕە/ جەفاش سەد بارەن، وەفاش یەک زەڕە «سەیدی»› ☰ غرە؛ مغرور

**خەڕەک / xeřek/:** ناو. دەزگای پەمۆ ڕستن؛ ئامرازی لۆکە ڕستن ‹مەسەل دنیا ژن و چەرخیش خەڕەک دەم ـ دەم بە دووخی غەم/ ڕەگی تاری وجوودت با دەدا هێشتاکو هەر خاوی «نالی»› ☰ ابزار پنبەریسی

**خەڕەم / xeřem/:** ☜ **خەڕڕەمە**

**خەڕی / xeřî/:** ☜ **خەڕە**[1]

**خەز / xez/**: ناو. ١. دەڵەک؛ کووژە؛ کویژک؛ گیانەوەرێکی ڕاوی گوهاندار و گۆشتخۆرە، پێستی پشتی لە هاویناندا قاوەیی و ژێر سکی سپییە و لە زستاندا هەمووی سپی دەبێتەوە و تەنیا جووچکەی بە بۆری دەمێنێتەوە، کە لەم کاتەدا «قاقم»ی پێئێژن ٢. پێستی ئەم گیانەوەرە و گیانەوەرانی تر (وەک: ڕێوی، کەروێشک، گورگ، سمۆرە و...) موویان نەرم و بریقەدار و تیسکنە و هەر بەو هۆیەوە کوت، پاڵتاو، کیف و کڵاوی لێ دروست دەکەن ‹ئەو کەی نە جای خەز پەلاسش پۆشان؟/ کەی چوون قەیس پەی تۆ زووخاوش نۆشان؟ «خانای قوبادی»› ٣. بەز؛ چەوری ‹هەمووی خەز و بەزە› ١و٢. خز ٣. چربی

**خەزاز / xezaz/**: ئاوەڵناو. خۆخۆر؛ خۆخوەر خودخور

**خەزازی / xezazî/**: ناو. خۆخۆری؛ کار و ڕەوتی خەم و خەفەتی زۆر خواردن و نەدرکاندنی خودخوری

**خەزاڵ / xezal/**: ناو. ١. ☜ خەزاڵ ٢. قشقەڕە ١. ☜ خەزاڵ ٢. کلاغ زاغی

**خەزاڵ[1] / xezał/**: ناو. خەزال؛ غەزاڵ: ١. کەژاڵ؛ ئاسک؛ مامز ٢. قشقەڵە؛ قەلەبازەڵە ١. آهو؛ غزال ٢. کلاغ زاغی

**خەزاڵ[2]**: ئاوەڵناو. خەزال؛ غەزال: ١. گوێ خەنەیی و لەش ڕەش و بۆر (بزن) ٢. لاجانگ خەنەیی و لەش بۆر (بزن) ١. سیاه گوش قرمز (بُز) ٢. خاکستری گوش قرمز (بُز)

**خەزاڵی / xezałî/**: ☜ خەزایی

**خەزام / xezam/**: ناو. ١. پایز؛ کزی دوای هاوین ٢. گەڵاڕێزان ٣. خەزەڵ؛ گەڵای زەردی پایز ١. خزان ٢. برگریزان ٣. برگ خزان

**خەزان / xezan/**: ناو. ١. دەمی خەزەڵوەر؛ گەڵاڕێزان؛ خەزام ‹گێژەلووکەی بە سام و توندی خەزان/ کە پەلاماری دایە باخ و ڕەزان «هێمن»› ٢. گەڵای زەردی پاییز ‹وەشلەیم بە خەزان بە وێش مەبۆ زەرد/ ئەو جە وادەی وێش، من جە تاو دەرد «بێسارانی»› ٣. قازان؛ بەرۆش؛ مەنجەڵ ٤. تیانی حەمام ١. برگریزان ٢. برگ زرد پاییزی ٣. دیگ مسی ٤. خزانەی گرمابە

⊡ **خەزان کردن**: زەرد هەڵگەڕان و داوەرینی گەڵا زرد شدن و ریختن برگ‌ها

**خەزانە / xezane/**: ☜ **خەزێنە ـ١**

**خەزایی / xezayî/**: ناو. خەزاڵی؛ ئاگرمەلووچ؛ ئاگرمەلیچ؛ ئایلەمەن؛ ئاینەمەل؛ تشمەلیچ؛ ساربەڵەک؛ سارکیبەڵەک؛ سمدمەد؛ سێرووبەلەکە؛ سێرووخەزاڵە؛ تووخۆرە؛ عایلەمەن؛ عەینەمەل؛ کوللەخۆرە؛ کەشوشک؛ کەشوێلە؛ مەلێکە لە تۆرەمەی سێروو، دەوری ٢٠ سانتیمیترە، وێنە و ئاکاری لە سێروو دەچێ، بەڵام لە فڕیندا جیاوازە، پشت، پاشەڵ و بەر زگی سپییە و سەر و باڵ و کلکی ڕەشی بریقەدارە، نەختێ کاکۆڵی هەیە، دەندووکی ئاماڵزەرد و لاقی سپیواشە، بە گەل دەژی و زیاتر لە دەوروبەری مێگەل و گاڕان چینە دەکا، لە کوندا هێلانە دەکا و هاوینان زۆرە سار صورتی

**خەزخۆ / xezxo/**: ناو. قازان؛ مەنجەڵ دیگ مسی بزرگ

**خەزر / xezr/**: ناو. ١. تووڕەیی؛ ڕک ٢. مان؛ کار و ڕەوتی پێچەقاندن ١. خشم ٢. سرسختی

**خەزرین / xezrîn/**: چاوگ. خەنزرین: ١. دە ڕکەوە چوون ٢. مان گرتن ١. خشمگین شدن ٢. اعتصاب کردن

**خەزریو / xezrîw/**: ئاوەڵناو. ١. غەزریو؛ دەرکەوەچوو ٢. مانگرتوو ١. خشمگین ٢. اعتصاب‌کردە

**خەزگ**[1] / xez(i)g/: ناو. ١. حەریر؛ بەرگی ئاوریشم ٢. لێژایی؛ سەرەولێژایی ≡ ١. حریر ٢. سراشیبی

**خەزگ**[2]: ئاوەڵناو. خز؛ لووس ‹ئەو چیتـە زۆر خـەزگ بوو› ≡ لیز

**خەزگاڵ** / xezgał/: سارسته. خۆزی؛ خوزەو؛ خۆزگا؛ کاشکا ≡ کاش

**خەزگان** / xezgan/: ناو. خەزان؛ قازان؛ بـەرۆش ≡ دیگ

**خەزن** / xez(i)n/: ناو. ١. ژن‌خوشک؛ خۆشکی ژن ٢. کاری هەڵگرتن لە شـوێنێ ≡ ١. خـواهرزن ٢. نگهداری در جایی

**خەزنـە** / xezne/: نـاو. غەزێنـــە: ١. خەزێنـــە؛ گەنجینە؛ گەنج ٢. تیانی حەمام ≡ ١. گنجینـە ٢. خزانەی حمام

**خەزۆک** / xezok/: ئاوەڵـناو. خـزۆک؛ خشـۆک؛ بـە تایبەتمەندی یان توانای خزینەوە ≡ خزنده

**خەزوور** / xezûr/: ناو. خەزوورە؛ خوەزوور؛ خـەزیر؛ خەزیور؛ هوسوورە؛ هوسیرە؛ هەسروێ؛ هەسوورە؛ هەسیرۆ؛ باوکی هاوسەر ≡ پدر همسر

**خەزوورە** / xezûre/: ☜ **خەزوور**

**خەزە** / xeze/: ناو. ترس؛ تەرس ≡ ترس

**خەزەڵ**[1] / xezeł/: ناو. گەڵای زەردی پـاییز ‹پـاییزە لە من درەنگە لە تـۆ/ سـوور دەبـوون خـەزەڵ، زەرد دەبوون لیمۆ «فولکلۆر»› ≡ برگ خزان

**خەزەڵ**[2]: ئاوەڵـناو. مووی دەست و پیل زەرد (بـزن) ≡ دست و شانە زرد (بُز)

**خەزەڵوەر** / xezełwer/: ناو. گەڵاڕێزان؛ غەزەڵوەر: ١. وەرزتـەکنان؛ سەرپەڵـە؛ ئـاوان؛ وەران؛ مـانگی هەشـتەمی سالـی هـەتاویَ کـە سـی ڕۆژە ٢. هـەڕەتی وەریـنی گـەڵای داران ≡ ١. آبـان ٢. برگ‌ریزان

**خەزەڵوەرین** / xezełwerîn/: ☜ **خەزەڵوەرێن**

**خەزەڵوەرێن** / xezełwerên/: ناو. خـەزەڵ‌وەریـن؛ گـەڵاڕێزان؛ کـاتی وەریــنی گــەڵای داران ‹...ئەلحانەکانە ئـەوە پیرەپـاییزە، خـەزەڵ‌وەرێنـە، خـێڵ سەربەرەو ژێرە، لە من هاتۆتەوە محـەلی دە دەسـت لێکبەردانێ ... «*پایزە*»› ≡ برگ‌ریزان

**خەزەڵۆک** / xezełok/: ناو. گیایەکە ≡ گیاهی است

**خەزیاندن** / xezyandin/: چاوگ. ئێرەیـی بـردن؛ چاو (پێ) هەڵنەهاتن ≡ حسادت بردن

**خەزیر** / xezîr/: ☜ **خەزوور**

**خەزیموک** / xezîmûk/: ناو. شـیوی چەوەنـدەر و گەنم ≡ آش شلغم و گندم

**خەزیور** / xezîwir/: ☜ **خەزوور**

**خەزێم** / xezêm/: ناو. خەزێمـە؛ غـەزێم؛ ئاڵـقەی نێوان کونەلووت بـۆ جـوانی ‹سـەرگەردان و مـاڵ وێـرانی ئـەوان خـەزێم شـۆڕانم پـایزە «*پـایزە*»› ≡ حلقەی زیور بینی

**خەزێمۆک** / xezêmok/: ناو. گیایەکـە گوڵـی زەرد دەکا ≡ گیاهی با گل‌های زرد رنگ

**خەزێمە** / xezême/: ☜ **خەزێم**

**خەزێنە** / xezêne/: ناو. ١. خەزنە؛ خەزانە؛ هۆدەی ڕاگرتنی پارە و شتی گرانبایی ‹پـەڕی دیوانەکـەت گەنجە و خەزێنە/ وشەی شیرینی تۆ دوژمـن‌تەزێنـە «هێمن»› ٢. سوول؛ حەوزۆکەی گەرماوی پێشوو ≡ ١. خزانە ٢. حوضچەی حمام‌های قدیم

**خەزێنـەدار** / xezênedar/: نـاو. گەنجینـــەوان ≡ خزانەدار

**خەس** / xes/: ☜ **خەست**

**خەسار**[1] / xesar/: ناو. ١. ☜ **خـەسـارە** ٢. زیـان؛ زەرەر ≡ ١. ☜ **خەسارە** ٢. زیان

⊡ **هـەر ئـەقڵێ لـە خەسـارێ بـوێ** پـاش هــەر هەڵەیەک و زیـان وەبەرکـەوتنێ، ئـەزموونێک دەس کـەوتن (واتـا: دەبـێ هەڵـەیەک بکـەی و خەسارێکت لێ کەوێ تا ئەزموونێ، ئەقڵێکت دەس کەوێ) ≡ هر خسارتی تجربه‌ای در پی داشتن

**خەسار**[٢]: ئاوەڵناو. بە فیڕۆ چوو 🇮🇷 هدررفته

**خەساراو / xesaraw**/: ناو. پاشاو؛ ئاوی دەرچوو لە زەوی ئاژین‌کراو 🇮🇷 آبی که از زمین بیرون می‌رود و هدر می‌شود

**خەساربو / xesarbû**/: ئاوەڵناو. ئاوبردە؛ لەکیس‌چوو 🇮🇷 تلف‌شده

**خەسارە / xesare**/: ناو. خەسار؛ داری ژێر کاریتە بۆ پارازتنی دیوار لە قورسایی کاریتە 🇮🇷 ستون چوبی خانه

**خەسارەت / xesaret**/: ناو. ١. زیان؛ زەرەر ٢. تاوان؛ ئەو پارەیە بۆ قەرەبووی زیان، دەدرێ یان وەردەگیردرێ 🇮🇷 ١. زیان ٢. خسارت

**خەساس / xesas**/: ناو. خەسۆک؛ گوندەرهێن؛ وەستای گون دەرهێنان 🇮🇷 اخته‌کننده

**خەسان / xesan**/: چاوگ. تێنەپەڕ. //خەسای؛ دەخەسێ؛ بخەسێ// خەسیان؛ هێلکە گون دەرهاتن 🇮🇷 اخته شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: خەساو/ چاوگی نەرێنی: نەخەسان

**خەساندن / xesandin**/: چاوگ. تێپەڕ. //خەساندت؛ دەخەسێنی؛ بخەسێنە// خەسانن؛ خەرساندن؛ خەرسانن: ١. گون دەرهێنان ٢. سەر لک پەڕاندنی دار ٣. *[مەجاز]* لە کار خستن ‹لەوەتا حەقی واژۆیان لێ‌سەندۆتەوە خەساندوویانە› 🇮🇷 ١. اخته کردن ٢. هرس کردن درخت ٣. از کار انداختن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: -/ چاوگی نەرێنی: نەخەساندن

**خەسانن / xesanin**/: ☜ خەساندن

**خەساو / xesaw**/: ئاوەڵناو. ١. خەسیاو؛ خەسیو؛ خەسیاگ؛ گون‌دەرهاتوو ٢. سەرلک‌پەڕێندراو 🇮🇷 ١. اخته ٢. هرس‌شده

**خەسپال / xespal**/: ئاوەڵناو. زورهان؛ لەکارکەوتە 🇮🇷 ازکار افتاده

**خەسپەن / xespen**/: ناو. ئەرک؛ ڕاسپێری 🇮🇷 وظیفه

**خەست / xest**/: ئاوەڵناو. خەس؛ تیر؛ هەس؛ دژی تەڕ ‹ماستی خەست› 🇮🇷 غلیظ

**خەستاو / xestaw**/: ئاوەڵناو. خەست 🇮🇷 غلیظ

**خەستوخۆڵ / xest û xoł**/: ئاوەڵناو. خەس‌وخۆڵ: ١. هەس‌وهۆڵ ٢. *[مەجاز]* ڕەشەمەس؛ سەرخۆشی زۆر مەست 🇮🇷 ١. غلیظ و پُرمایه ٢. مست ششدانگ

**خەستە**[١] / **xeste**/: ناو. خەسە: ١. نەخۆش ٢. هەسێنە؛ دۆی دە تەوورەکەکراو 🇮🇷 ١. بیمار ٢. دوغ چکیده

**خەستە**[٢]: ئاوەڵناو. خەسە؛ ماندوو؛ مانی؛ شەکەت ‹حەلقە ـ حەلقەی چ دەکەی داوی کەمەندی زولفت / بۆ دلی خەستە کە وا بەستەیی هەودایێکە؟ «نالی»› 🇮🇷 خسته

**خەستەخانە / xestexane**/: ناو. خەسەخانە؛ نەخۆشخانە؛ دامەزراوەیەک بە ئامراز و کەرستە و کارگێڕانی تەیارەوە بۆ ڕاگرتن و دەرمانی نەخۆشان 🇮🇷 بیمارستان

**خەستەک / xestek**/: ناو. کەوەی تاریک؛ ڕەنگی شینی تۆخ 🇮🇷 کبود تیره

**خەستەوەبو / xestewebû**/: ئاوەڵناو. هەسێنە؛ خەستە 🇮🇷 غلیظ شده

**خەستی / xestî**/: ناو. خەسی؛ هەسی؛ تیری؛ دژی تراوی 🇮🇷 غلظت

**خەستێنە / xestêne**/: ناو. هەسێنە؛ دۆی خەستەوەبووی بنی دەوانە 🇮🇷 دوغ چکیده

**خەسجر / xescir**/: ئاوەڵناو. شێواو 🇮🇷 آشفته

**خەسرک / xesrik**/: ناو. قەرتاڵەی زل؛ تریانی گەورە 🇮🇷 سبد بزرگ

**خەسرەوانی / xesrewanî**/: ناو. ١. کووپەی زۆر زل ٢. ئاهەنگێکە لە دەزگای مووسیقای ئێرانیدا 🇮🇷 ١. خُم بزرگ ٢. خسروانی

**خەسک / xesk**/: ناو. گیایەکە گوڵی زەردی هەیە

▆ گیاهی با گل‌های زردرنگ

**خەسن** / xesin/: ☜ **خوسن**

**خەسنای** / xesnay/: چاوگ. خەساندن ▆ اختە کردن

**خەس‌وخۆڵ** / xes û xoł/: ☜ **خەست‌وخۆڵ**

**خەسۆک** / xesok/: ☜ **خەساس**

**خەسو** / xesû/: ناو. خەسی؛ خواسی؛ خۆسسی؛ خاش؛ هوسیرەما ▆ مادر همسر

**خەسە** / xese/: ☜ **خەستە**

**خەسەخانە** / xesexane/: ☜ **خەستەخانە**

**خەسی** / xesî/: ☜ **خەسو**

**خەسیاگ** / xesyag/: ☜ **خەساو-١**

**خەسیان** / xesyan/: ☜ **خەسان**

**خەسیاو** / xesyaw/: ☜ **خەساو-١**

**خەسیای** / xesyay/: چاوگ. خەسان ▆ اختە شدن

**خەسیس** / xesîs/: ئاوەڵناو. چرووک؛ ڕژد؛ چکووس؛ دەس‌قووچاو ▆ خسیس

**خەسین** / xesîn/: چاوگ. ١. خەساندن ٢. خەسان ▆ ١. اختە کردن ٢. اختە شدن

**خەسیو** / xesîw/: ☜ **خەساو -١**

**خەسێنران** / xesênran/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //خەسێنرای؛ دەخەسێنرێی؛ بخەسێنرێ// خەسین؛ خەسیان ▆ اختە شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: خەسێنراو/ چاوگی نەرێنی: نەخەسێنران

**خەسێنراو** / xesênraw/: ئاوەڵناو. خەسیاگ؛ خواجا؛ خواجە ▆ اختەشدە

**خەش** / xeş/: ناو. خەوش؛ کەمایەسی؛ عەیب ‹ڕۆنێکە خەشی تێدا نییە› ▆ غش

**خەشاب** / xeşab/: ناو. ساجوور؛ ساژوور ▆ خشاب تیر

**خەشخاش** / xeşxaş/: ☜ **خاشخاش[١]-١**

**خەشخاشک** / xeşxaşik/: ناو. خاشخاش؛ خاشخاشۆکێ؛ مێلاق؛ مێلاقە؛ گولالە؛ گورالە؛ هەلالە؛ گولالەسوورە؛ سوورەهەرالە؛ گولەخەندران؛ گولەبەوی؛ گولەمۆلە؛ نیسان؛ کورکەنیسان؛ گولالە سوورەی بەهاران؛ گیایەکی ئالیکی لە تیرەی هەلالە، بە گەلای تووکن و بڕگەبڕگە، گولی سووری تۆخ و پەڵە ـ پەڵەی ڕەش، پەرچەمی زۆر و بەری وەک خەشخاش، بەلام بچووکترەوە ▆ شقایق

**خەشکاندن** / xeşkandin/: ☜ **خلیسکاندن**

**خەشکین** / xeşkîn/: ☜ **خلیسکان**

**خەش‌وخاڵ** / xeş û xał/: ناو. پووش؛ چیلکە؛ پرووپووش ▆ خاشاک

**خەشۆ** / xeşo/: ئاوەڵناو. بلح؛ گێل و نەزان ▆ ابلە

**خەشول** / xeşûl/: ناو. گیایەکی گەلازەردە کە مێش‌هەنگوین حەزی لێیە ▆ گیاهی است

**خەشە** / xeşe/: ناو. خەرار؛ جەوالی لە موو ▆ جوال موین

**خەشەخوری** / xeşexurî/: ناو. هۆر؛ گۆنی زۆر گەورە کە خوری تێ دەخەن ▆ گونی بزرگ حمل پشم

**خەشەماسی** / xeşemasî/: ناو. خاتووماسی؛ ماسییەکی پنۆک ـ پنۆک ▆ نوعی ماهی

**خەشەوێنجە** / xeşewênce/: ☜ **وێتجەخەشە**

**خەشیفک** / xeşîfik/: ناو. هۆڕ؛ جەوالی یەکسەری زەلام ▆ جوال بزرگ

**خەشیقولک** / xeşîqul(i)k/: ناو. سەرەوژێری؛ خلیسک؛ سەرەولێژایی ▆ سراشیبی

**خەشیل** / xeşîl/: ناو. خوشیلک ▆ گیاهی است

**خەشیم** / xeşîm/: ئاوەڵناو. غەشیم؛ کارنەزان؛ ناشی؛ فێرەکار نەکراو ▆ ناشی

**خەف[١]** / xef/: ناو. خەو؛ خاو ▆ خواب

**خەف[٢]**: ئاوەڵناو. نهێنی؛ نادیار ▆ نهانی

**خەفان** / xefan/: چاوگ. خەفیای: ١. خەوتن؛

نووستن ٢. چەمانەوە ٣. ڕاکشـان 🇮🇷 ١. خفـتن ٢. خم شدن ٣. دراز کشیدن

**خەفاندن / xefandin/:** ☜ **خەواندن**

⊡ **خەفانـدن: خـەفانن بـۆ کەسێ:** لــە بەرانبــەر کەســێکەوە نــەرم و نیــانی نیشــان دان تــا ڕادەیەک ببێتە هۆی زاڵ بوون و زۆربێژی ئـەو کەسە 🇮🇷 ضعف نشان دادن در مقابل کسی

**خەفانن / xefanin/:** ☜ **خەواندن**

**خەفتان[١] / xeftan/:** چاوگ. خـەفتیان؛ خـەفتین: ١. خەبتان؛ خـەبتین؛ تێکۆشـین ٢. چـاوەنۆڕی دەرفەت بوون 🇮🇷 ١. کوشیدن ٢. پی فرصت بودن

**خەفتان[٢]:** ناو. ١. حشکاوس؛ ئیشکاوس؛ تـۆوی بـە زەوی وشکدا پژاو ٢. کراسی ئاوریشم لە بن زرێوە ٣. سەرۆکی گەمیـە ٤. کـەوای سـەرداری 🇮🇷 ١. تخم پاشیده بر زمین خشـک ٢. کژاغنـد ٣. ناخـدا ۴. قبای سرداری

**خەفتگ / xeftig/:** ناوەلـناو. ١. نووسـتوو؛ خـەوتوو؛ خەو لێکەوتوو ٢. چـەمێنراوی بـە سـەر زەویـدا ڕاکێشراو 🇮🇷 ١. خُفته ٢. بر زمین خوابانیده شده

**خەفتن / xeftin/:** ☜ **خەوتن**

**خەفتو[١] / xeftû/:** نـاو. خـەفچ؛ مۆتـە؛ مۆتەکـە 🇮🇷 کابوس

**خەفتو[٢]:** ناوەلناو. نووسـتوو؛ خـەوتوو؛ خـەفتگ 🇮🇷 خُفته

**خەفتیان[١] / xeft(i)yan/:** ☜ **خەفتان[١]**

**خەفتیان[٢]:** ناو. ساردەپایز کە تازە ناشێ تووی تێـدا بچێنن 🇮🇷 سرمای پاییز که اجازەی کشت ندهد

**خەفتین / xeftîn/:** ☜ **خەفتان[١]**

**خەفچ / xefç/:** نـاو. مۆتەکـە؛ مۆتـە؛ خـەفتوو 🇮🇷 کابوس

**خەفزان / xefzan/:** ناو. ١. خیفزان؛ فاڵگـرەوە ٢. غەیبوێژ؛ سـرئوش؛ سـیمیار؛ زانـا بـە نادیـاران؛ ئـەوەی لـە نهـێنی هـەواڵ دەدا 🇮🇷 ١. فـالگیر ٢. غیبگو

**خەفک / xef(i)k/:** ناو. خەفگ: ١. تەڵە؛ خەپک ٢. ئامرازێکە لە هەوجاڕدا 🇮🇷 ١. تله ٢. ابزاری در خیش

**خەفگ / xef(i)g/:** ☜ **خەفك**

**خەفگە / xefge/:** نـاو. ١. جـێ‌خـەو؛ جێگـەی نووستن ٢. خەفە؛ تەرە؛ چاڵکەی ڕاگرتنی میوە و تووتن 🇮🇷 ١. خوابگاه ٢. گودال مخصوص نگهـداری میوه و برگ توتون

**خەفنای / xefnay/:** ☜ **خەواندن**

**خەفۆک / xefok/:** نـاو. خەوۆک: ١. ئەو گایەی لـە خـەتی جووتـدا دەخـەوێ ٢. *[کینایـە]* مـرۆی خەوخەو 🇮🇷 ١. گاوی که هنگام شخم مـی‌خوابـد ٢. آدم خواب‌آلود

**خەفە[١] / xefe/:** ☜ **خەفگە ـ٢**

⊡ **نیانە خەفە:** دە چاڵ خستنی میوە و ـ بەتایبەت ـ گەڵا تووتن 🇮🇷 گذاشتن میوه و بویژه برگ توتـون در گودال

**خەفە[٢]:** ناوەڵناو. ١. خنکاو ٢. بێ‌ڕووناکـایی ٣. کـز ٤. پشوو لێبڕاو ٥. کوژاوە (بۆ ئاور دەگوترێ) 🇮🇷 ١. خفه ٢. کم نور ٣. ضـعیف ۴. بـی‌تکـان و حرکـت ۵. خاموش

⊡ **خەفە کردن:** ١. خنکاندن ٢. کز کـردنی گـڕی چرا ٣. کز کردنی تین ٤. پشـوو لـێبـڕین ٥. *[مەجاز]* بێدەنگ کردن 🇮🇷 ١. خفه کـردن ٢. کـم کردن شعلەی چراغ ٣. کم کـردن حـرارت ۴. بـی حرکت ساختن ۵. ساکت کردن

**خەفـەت / xefet/:** نـاو. خـەم؛ کەسـەر؛ کـوڵ؛ مەینەت؛ جخـار ‹خێڵخانەی خەفـەت باربەنـدیش کـەردەن/ مەینـەت ڕوو نیـان وە مـەئوای مـەردەن «مەولەوی»› 🇮🇷 غصه؛ اندوه

⊡ **خەفەت خواردن:** *[مەجاز]* خەم خواردن ‹ئـاخیری ڕۆژەکیش دەبێ وەعدی/ خەفەتم بۆ بخۆن وەکـوو سەعدی «حاجی قادر»› 🇮🇷 غصه خوردن

**خەفەتبار** / xefetbar/: ناوەڵناو. دڵبکوڵ؛ مەینەتبار؛ خەمبار ‹دەرمانی خەفەت: مەیە، مەیە، مەی/ خەفەتبار نەکەی هەرگیز تەرکی کەی! «هەژار، *بۆکوردستان*»›. هەروەها: **خەفەتباری** ⇐ اندوهگین

**خەفەتبەر** / xefetber/: ناوەڵناو. خەفەتلابەر؛ خەمڕەوێن ⇐ غمزُدا

**خەفەتخان** / xefetxan/: ناوەڵناو. خەفەتبار ⇐ اندوهگین

**خەفەتلابەر** / xefetlaber/: ناوەڵناو. خەفەتبەر؛ خەمڕەوێن ⇐ غمزدا

**خەفەتهێن** / xefethên/: ناوەڵناو. هۆی خەم و کەسەر ⇐ اندوهزا؛ غم‌آور

**خەفەنگ** / xefeng/: ناو. دەلاقەی هەواکێش ⇐ پنجرەی هواکش

**خەفیاگ** / xefyag/: ناوەڵناو. چەمێنراوی ژێر خاک کراوی وەچ داو ⇐ زیر خاک خوابانیده و جوانه‌زده

**خەفیای** / xefyay/: ☜ **خەفان**

**خەڤ** / xev/: ☜ **خەو-١**

**خەلا** / xela/: ناو. ئاودەست؛ دەساو؛ سەرپێشاو؛ مەبال ⇐ مُستراح

**خەلاس**[1] / xelas/: ناوەڵناو. ١. دوایی‌هاتوو ٢. ڕزگار ⇐ ١. باقی‌نمانده ٢. رهایی‌یافته

◘ **خەلاس کردن**: ١. ڕزگار کردن؛ نەجات دان ‹تێکدا ب شەفاعەتا خوە خاس کە!/ ڤێکڕا مە ژ ئاگرێ خەلاس کە! «ئەحمەدی خانی»› ٢. تەواو کردن؛ هیچ نەهێشتن ‹زۆر برسی بوو، چێشتەکەی خەلاس کرد› ٣. *[کینایە]* کوشتن ‹خەلاسی کە با ئێش نەکێشێ›. هەروەها: **خەلاس بوون** ⇐ ١. نجات دادن؛ رهایی دادن ٢. تمام کردن ٣. کُشتن

**خەلاس**[2]: سارستە. نەجات؛ ئیتر تەواو ‹کاری خۆی کرد و خەلاس!› ⇐ تمام

**خەلاسبوو** / xelasbû/: ناوەڵناو. بەرتەرەف؛ لەبەین‌چوو ⇐ برطرف

**خەلاسی** / xelasî/: ناو. ڕزگاری ‹خەریکی شەش‌دەری هات‌ونەهاتم/ خەلاسیم قەت نییە لەم نەردە بێ تۆ «نالی»›. هەروەها: **خەلاسی هاتن** ⇐ رهایی

**خەلالوک** / xelalûk/: ناو. گەروو؛ گەڵوو؛ قوڕگ ⇐ گلو

**خەلامور** / xelamûr/: ناو. پۆل؛ پۆلوو؛ سکڵ؛ پەن ⇐ اخگر

**خەلان**[1] / xelan/: چاوگ. شکانی وەک ئێسکی قاچ و دەست ⇐ شکستن استخوان ساق و بازو

**خەلان**[2]: ناو. کۆزی ئاژەڵان لە دەشت ⇐ آغل‌های بیابانی

**خەلاندن** / xelandin/: ☜ **غەلاندن**

**خەلسان** / xelsan/: چاوگ. خەلیسیای؛ نەجات بوون ⇐ نجات یافتن

**خەلساندن** / xelsandin/: چاوگ. خەلیسنای؛ نەجات دان ⇐ نجات دادن

**خەلستن** / xelistin/: چاوگ. ڕزگار بوون؛ دەرچوون و نەجات بوون ⇐ رهایی یافتن

**خەلسک** / xelisk/: ناو. تیسک؛ زەنگەتە ترێ ⇐ تلسک انگور

**خەلسیو** / xelsîw/: ناوەڵناو. ڕەها؛ دەرباز ⇐ رها

**خەلفە** / xelfe/: ناو. جادار؛ جێنشین؛ جێگر ⇐ جانشین

**خەلقنای** / xelqnay/: چاوگ. خەلق کردن؛ خوڵقاندن ⇐ آفریدن

**خەلقیای** / xelqyay/: چاوگ. خەلق بوون؛ خوڵقان ⇐ آفریده شدن

**خەلۆل**[1] / xelol/: ناو. میچە گوێلک؛ جگە گۆلک ⇐ قاپ گوساله

**خەلۆل**[2]: ناوەڵناو. *[کینایە]* ناقۆڵای زەلام ⇐ گُنده

**خەلە** / xele/: ناو. غەلە؛ خەلیە؛ دانەوێڵە؛ دەخڵ؛

کشان ■ عمل کشیدن بر روی زمین

**خێشەخێش / xêşe xêş/**: ئاوەڵکار. کێشەکێش؛ کـاری بە نهێم کێشان بە سەر زەویدا ■ کشان ـ کشان

**خێڤزان / xêvzan/**: ☜ **خیڤزان**

**خێل / xêl/**: ئاوەڵناو. چـاوخوار؛ خوێـل ‹پـێم دەڵـێن مەحبووبە خێل و قیچە مەیلی شەڕ دەکا/ خێل و قیچە یا تەرازووی نازی نەختێ سەر دەکا؟ «نالی»› ■ لوچ

**خێلی / xêlî/**: نـاو. ١. ڕووبەنـد؛ پەچـە؛ پووشـی؛ ڕووپـــۆش ٢. ســـێبەر و تـــەم ٣. نەخۆشـــی چاوخواری ٤. تارای بووک ■ ١. روبند ٢. سایە و مە ٣. لوچی ۴. پارچـەی قرمـزی کـە روی صـورت عروس می‌کشند

**خێڵ / xêł/**: نـاو. ١. کۆمەڵـی هـەوارچی ‹پرسـیم لـە سیروان تۆ بۆچی وێڵی/ پاییز و بەهار ڕێبازگەی خێڵـی «فولکلۆر»› ٢. هۆز؛ عەشرەت ■ ١. گروە چادرنشـین ٢. عشیرت

**خێڵات / xêłat/**: ناو. خێڵی زۆر؛ ڕەوەند ■ ایلات

**خێڵاتـی / xêłatî/**: ئاوەڵـناو. قەراجـــدار؛ گۆچـــەری؛ کۆچەری ■ ایلاتی

**خێڵخانـە / xêłxane/**: نـاو. بارگـــە و بنـــە ‹چۆنـــەن خەیمەگای خاڵ لاجوەردان/ خێڵخانەی خاسـان خـارا پەروەردان «خانای قوبادی»› ■ باروبندیل

**خێڵخێڵ / xêłxêł/**: ئاوەڵناو. میـل ـ میـل؛ ڕا ـــ ڕا؛ ڕێ- ڕێ ■ راه ـ راه

**خێڵەک / xêłek/**: ناو. چارشێو ■ چادر

**خێڵەکی / xêłekî/**: ئاوەڵناو. سەربەخێڵ؛ تایبـەت بـە خێڵ ‹شەڕی خێڵەکی› ■ عشیرەای

**خێم / xêm/**: ئاوەڵـناو. سـەربەرەژێر؛ سەرنشـێو ■ سرازیر

**خێن[1] / xên/**: ☜ **خوێن**

**خێن[2]**: ئامراز. جگە؛ بێجگە ■ بجز

**خێـنج / xênc/**: ئامراز. خێنژ؛ جگە؛ بل؛ بێجگە ■ بـە غیر از

**خێندن / xêndin/**: ☜ **خوێندن**

**خێنژ / xênij/**: ☜ **خێنج**

**خێنگ / xênig/**: نـاو. خوشـک؛ خویشـک؛ خـوار ■ خواهر

**خێنی / xênî/**: ناو. خانوو؛ ماڵ ■ خانە؛ سرا

**خێو / xêw/**: ناو. ١. خاوەن؛ خێو ٢. *[باوەڕی کۆن]* جنۆکە؛ خودای کانی و ئاوان ‹ئـەو دێـوە جـاران خێوی کانی بوو/ سەبەب تاریکی و هیچ نەزانی بـوو «موفتی پێنجوینی»› ٣. کاری ڕاهێنان و ژیانـدن ■ ١. صـاحب ٢. ربالنـوع آب و چشـمەساران ٣. پرورش

**خێـوان / xêwan/**: چـاوگ. خێـوتن؛ ڕێـک کـەوتن؛ پەسوان ■ متفق شدن

**خێوانـــدن / xêwandin/**: چـــاوگ. ســـــرەواندن؛ خەوانـدن؛ داهێنانـەوی زەبـر ‹زللەیـەکی خێوانـدە لاملی!› ■ زدن

**خێوانە / xêwane/**: ناو. بەرکوت؛ گەنمێ کە بەر لـە هەرەتی دروێنـە دەیـدروون و گێـرە دەکـرێ بـۆ خواردن ■ پیشکوب غلە

**خێوتن / xêwtin/**: ☜ **خێوان**

**خێور / xêwir/**: ئاوەڵـناو. هورفی؛ خـەرفیو؛ خـەرفاو؛ هۆش‌لێبڕاو لەبەر پیری یان کزی ■ خَرَف

**خێوران / xêw(i)ran/**: چاوگ. توانـەوە (بـۆ خـوراکی دەیلێن) ■ آب شدن

**خێورانەوە / xêw(i)ranewe/**: چـاوگ. توانەوە ■ آب شدن

**خێولکە / xêwilke/**: نـاو. هیزەی پچووک؛ خیگـەی چکۆلە ■ خیگ کوچک

**خێـوەت / xêwet/**: نـاو. چـادر؛ خەیمـە؛ کـۆن ■ خیمە

**خێوەنـد / xêwend/**: نـاو. خـاوەن؛ خـودان؛ خێـو؛ ساحێب ■ صاحب

**خێیـار / xêyar/**: ☜ **خەیار**

# د

**د / d/**: پیت. نیشانەی پیتی دەیەمی ئەلفوبێی زمانی کوردی ☰ د؛ نشانەی دهمین حرف الفبای کردی

**د¹ / di/**: ناو. ناوی پیتی دەیەمی ئەلفوبێتکەی زمانی کوردی ☰ دال؛ دهمین حرف الفبای زبان کُردی

**د²**: ئامراز. ژ: ١. نە؛ جە ‹ئەز د خۆوە ڕامێنم› ٢. لە ‹ئەڤ کەڤچک د شۆرباوێ مەنێ!› ☰ ١. از ٢. در

**د³**: دەنگ. دە؛ دا: ١. نیشانەی پێداگری و دنە دان ‹د هەرە!› ٢. نیشانەی تووڕەیی و بەرهەڵستی ‹د دەڤ ژ من بەردە!› ☰ ١. دِ، نشانەی تشجیع ٢. دِ، نشانەی خشم و مخالفت

**د ـ⁴**: پێشگر. دە ـ؛ ئە ـ؛ مە ـ؛ نیشانەی ڕانەبردووی درێژەدار ‹دچم؛ دبێژم› ☰ مـی ـ؛ نشانەی حال و آیندەی استمراری

**دا¹ / da/**: ناو. ١. دایک؛ داک ٢. وشەی سەرناوی ڕێزنان بۆ کچی شوو نەکردوو ‹دا مریەم› ☰ ١. مادر ٢. خانم (دختر)

**دا²**: ئامراز. تا؛ هەتا؛ هەیا؛ هەتاکوو: ١. وشەی مەرج ‹دا بۆ خۆم دێم هیچ مەکە!› ٢. بۆ ئەوەی ‹پەرچەمی ڕوو دادەپۆشێ، پێچی زولفی پێچەیە/ دا بە ڕۆژیش پێی بڵێن، شەمعی شەبستانی هەیە «نالی»› ٣. وتەی هاوگەری؛ وشەی هەڵسەنگاندن، بەرامبەر کردنەوە ‹من بەتەمەنم دا ئەو› ٤. نیشانەی دووری، بۆ کات یان جێگا ‹دا کەی دانیشم لە سای دارەبی؟/ دا کەی بکێشم جەفای غەریبی؟ «فولکلۆر»› ☰ ١ـ٤. تا

**دا³**: دەنگ. د؛ دە: ١. نیشانەی داخوازی ‹دا بۆ خوا ڕوحمێ، کەرەمێ!؛ دا بمدەیە!› ٢. نیشانەی فەرمان ‹دا دەنگ! بزانم چ دەڵێ؛ دا دەی!› ٣. نیشانەی پێداگری و دنە دان ‹دا هەرە!› ☰ دِ: ١. نشانەی درخواست ٢. نشانەی امر ٣. نشانەی تأکید

**دا ـ⁴**: پێشگر. ئەکەوێتە پێش چاوگێکەوە و چاوگێکی نوێ دروست دەکا. وەک: ١. بەرەو خوار؛ بەر بە خوار؛ لە سەرەوە بۆ خوار ‹داکەوتن؛ دانان؛ دانیشتن› ٢. لە نێوان؛ بە سەر ‹داگرتن؛ داپۆشین› ☰ ١. فرو ـ ٢. فرا ـ

| | | |
|---|---|---|
| دائینان | دابارین | دابران |
| دابوون | دابەزین | دابێژان |
| داپچران | داپرووسقان | داپژان |
| داپلۆخان | داپلۆسان | داپۆشان |
| داپێچان | داتاشین | داتکان |
| داتلیشان | داتەپان | داتەکان |
| داچلەکان | داچنیان | داچۆڕان |
| داچەقان | داخران | داخورپان |
| دادان | دارزان | دارمان |

داسەکنان　　داشکان　　داشۆران
داشەکان　　داقلیشیان　　داقنان
داکرمان　　داکوتان　　داکوژان
داگیران　　داگیرسان　　دالکان
دامالیان　　دامان　　دامەزران
دانران　　دانووشتان　　داوران
داوەران　　داوەشان　　داهێزان
داهێنان

• **دا**[5]: پاشگر. دەرخەری هەندێک گـرۆی ئیزافییـە کە زۆرتر دەوری ئاوەڵکاری دەگێڕن: *ئا)* لە ... دا ‹لە ماڵدا نەبوو؛ لە پێشدا دیبووی› *ب)* بە ... دا ‹بە دوویدا چووم؛ بە ڕێدا پێم گوت› ≡ پسوند قیدساز (از اختصاصات زبان کُردی)

**دا**[6]: سارستە. *[سووکەڵە]* داد؛ هـاوار ‹دا لـە دەسـتی ئاغای زاڵم!› ≡ داد؛ فریاد

**دا**[7]: لێل. ← **داوەدەرمان**

**دائاویستن / da'awîstin/**: چـاوگ. هەڵواسـین؛ هەڵاواسین ≡ آویزان کردن

**دائیخستن / da'îxistin/**: چـاوگ. ۱. داخسـتن؛ خستنە خوار ۲. *[مەجاز]* کردنە باو ≡ ۱. انداختن ۲. متداول کردن

**دائینان / da'înan/**: چـاوگ. داهێنـان: ۱. ڕۆهێشتن؛ لە سەرەوە بۆ خـوار داڵەقانـدن ۲. لـە نەبوو چێ کـرن ۳. بـە مشـار برینـەوە ٤. نـەوی کردنی لکی دار ٥. دەست پێدا مالـین ٦. شـانە کردن ≡ ۱. فروهشتن ۲. ابداع کردن ۳. با ارّه بُریدن ۴. کوتاه کردن شاخەی درخـت ۵. دست بـر چیـزی مالیدن ۶ شانه کردن

**داب**[1] **/ dab/**: نـاو. داپ؛ نەریت؛ دام و دەسـتوور ≡ رسم

**داب**[2]: ئاوەڵناو. هۆنـدراو لـە دامووسـک ≡ تنیـده از موی دُم اسب

**داباران / dabaran/**: ☜ **داباریـن**

**داباراندن / dabarandin/**: چـاوگ. دابـارانن؛ داوارانـن؛ هەڵـڕژاندن لـە سـەرەوە بـۆ خـوار ≡ فروباراندن

**دابارانن / dabaranin/**: ☜ **داباراندن**

**داباریـن / dabarîn/**: چـاوگ. دابـاران؛ داواران؛ داوارین: ۱. بـەرەوخوار هەڵـڕژان ۲. *[مەجاز]* لـە هەموو لاوە بە سـەر (کەسـێ یـان شـتێک)دا بـەر بوونەوە ‹بەڵا هەروەک کولە دابارییە سەر مەزرەعەی ئومێـد/ مەگـەر ئـەو تیپـی موژگانـە بکـەن وەک عەینەمەل چارێ «مەحوی»› ≡ ۱. فروباریـدن ۲. از هر سو بر سر (کسی یا چیزی) ریختن

**ـ دابـارێن / dabarên-/**: پاشەوشـە. ـــ داوەرێـن؛ ـ دارژێن؛ ئەوەی دادەبارێنێ ‹فرمێسکدابارێن› ≡ ـ فروریز

**داباش / dabaş/**: ناو. ۱. کار و ڕەوتی لێکۆڵـینەوە؛ تۆژینـەوە؛ بـە شـوێندا گـەڕان ۲. ئامۆژگـاری؛ مۆچیـاری ۳. جـەڕ؛ مچلگـە؛ بـاس و لێکدانـەوە ‹مەل لە سەر مژارێ داباش کـر› ٤. مـژار؛ بابـەت؛ بـاس ‹داباشـا پـەروەردە ئـو ڕاهێنانـا زارۆک› ✱ هەروەها: **داباش کردن** ≡ ۱. پـژوهش ۲. نصـیحت ۳. بحث ۴. موضوع

**دابردن / dabirdin/**: چاوگ. بەرەو خـوار بـردن ≡ به سوی پایین بردن

**دابرستین / dabiristîn/**: چاوگ. ڕیـز بەسـتن؛ بـە سەف بوون ≡ به صف شدن

**دابڕ**[1] **/ dabiř/**: نـاو. کەرت؛ کەر؛ لەت؛ پارچە؛ لەت و کەرتی لێک جیا ≡ قطعه

**دابڕ**[2]: ئاوەڵناو. داوڕ؛ دابڕ: ۱. دادڕ؛ پاژبوو ۲. بە زۆر ستێنراو ≡ ۱. جُدا شده ۲. غصب شده

▣ **دابڕ کردن**: داوڕ کردن: ۱. جیا کردنەوەی کەم لـە زۆر ۲. برینـەوە؛ برشـت دان ۳. پـەلکێش کردن؛ لق لێکردنەوە ٤. *[کینایە]* بە زۆر گرتن و بردن. هەروەها: **دابڕ بـوون** ≡ ۱. جدا کردن جزء

از کل ۲. بُرش دادن ۳. مُنشعب کـردن ۴. اشـغال/ غصب کردن

**دابـڕان** / dab(i)řan/: چـاوگ. ١. بـڕیان و جیـا بوونەوەی بەشێ لە شتێک ‹تا پێکەوە بوون هەموو بـڕاو بـوون/ کـە لێـک دابـڕان، جەرگبـڕاو بـوون «سـەیفولقوزات»› ٢. *[رامیـاری]* جیـا بوونـەوەی بەشێک لە خاکی ولاتێک لە ژێر دەسـەڵاتی ئـەو ولاتە ☰ ١. از هم جدا شدن ٢. تجزیه شدن

⊡ **لێک دابڕان**: لە یەکتر جیا بوونـەوە و پێوەنـدی نـەمان ‹ئـەو چـوو بـۆ هەنـدەران و ئیـدی لێـک دابڕاین› ☰ از هم جدا شدن

**دابڕانێ** / dab(i)řanê/: نـاو. ملـە؛ کێبـەرکێ لـە گوریس کێشاندا ☰ مسابقەی طناب‌کشی

**دابـڕاو** / dab(i)řaw/: ناوەڵـناو. ١. جیـاوەبوو؛ جیـابووگ ‹شـاد بوونـەوەی کچێکـی دابـڕاو بـە گەیشتنەوە نـاو خێزانەکـەی، دوای چـوار سـاڵ› ٢. *[رامیاری]* داگیرکـراو؛ بـە دەر لـە ژێـر دەسـەڵاتی ولات ‹فەلەسـتین، ولاتی دابـڕاو› ☰ ١. جداشـده ٢. اشغال شده

**دابڕ ـ دابڕ** / dabiř dabiř/: ناوەڵـناو. لـەت ـ لـەت؛ پارچە ـ پارچە؛ کوت ـ کوت ‹هەڵمەتی بۆ بەرە وەک شێری دڕ/ لەشکری لێ بکە دابڕ ـ دابڕ «هـێمن»› ☰ قطعه ـ قطعه

**دابڕستن** / dabiřistin/: ☜ **دابڕسکان**

**دابڕسکان** / dabiř(i)skan/: چـاوگ. دابڕسـکین؛ دابڕستن؛ داپڕسکان؛ دابەڕزان؛ دابەڕزاندن؛ شاڵاو بردن؛ هەڵمەت هێنان؛ پەلامار دان بۆ ڕفاندن ☰ خیز برداشتن برای ربودن

**دابڕسکین** / dabiř(i)skîn/: ☜ **دابڕسکان**

**دابـڕین** / dab(i)řîn/: چـاوگ. داوڕیـن: ١. دابـڕ کردن؛ جیا کردنەوەی کەم لە زۆر ‹من کەسـێکم زەمانەیی ناکەس/ دایبڕیوم لە قـەوم و قیلـە و کـەس «حاجی قادر»› ٢. داگیر کردن؛ بە زۆر ئەسـتاندن ٣. بریندار بوون بە هۆی توند بوونی بەن لە لەش ٤. لەلە کردنی دار بە چەقۆ ☰ ١. جدا کردن جزء از کل ٢. غصب کردن ٣. زخمی شدن از فشار طناب بر بدن ٤. شکافتن یا ایجاد کردن شیار بر درخت

**دابستە** / dabiste/: ☜ **دابەستە**

**دابگردن** / dabigirdin/: چاوگ. پەڕینەوە؛ تێپەڕین ☰ عبور کردن

**دابلاندن** / dab(i)landin/: ☜ **دابەلاندن**

**دابنارتن** / dab(i)nartin/: چاوگ. چەقاندنی ڕیشە و نەمام ☰ غرس کردن

**دابونەریت** / dab û nerît/: ناو. ڕەسم و یاسـا؛ ڕێ و ڕەسم؛ نەریتەکانی نێو کۆمەڵگا ☰ رسم و رسوم

**دابۆرانـدن** / daborandin/: چـاوگ. تێپەڕانـدن؛ تێپەڕ کردن ☰ عبور دادن

**دابۆردن** / dabordin/: ☜ **دابورین**

**دابۆرین** / daborîn/: چاوگ. تێپەڕین؛ پەڕینەوە ☰ عبور کردن

**دابورانـدن** / dabûrandin/: چـاوگ. تێپەڕانـدن؛ گەزاندن ☰ عبور دادن

**دابووردن** / dabûrdin/: ☜ **دابورین**

**دابورین** / dabûrîn/: چاوگ. دابووردن؛ دابـۆردن؛ دابگردن؛ تێپەڕین ☰ گذشتن

**دابون** / dabûn/: چاوگ. چەمینـەوە، جـۆرێ کـە دەست بگاتە سەر زەمین ☰ خم شدن

**دابەرانـدن** / daberandin/: چـاوگ. پێشـکەش کردن ☰ تقدیم کردن

**دابـەڕزان** / dabeřzan/: چـاوگ. دابـەڕزین؛ داپڕسکان؛ هەڵمەت بـردن؛ بـە تونـدی هێـرش بردن ☰ یورش بردن

**دابـەڕزانـدن** / dabeřzandin/: چـاوگ. هەڵـمەت بردن بەر لە هەموو ☰ خیز برداشتن پیش از همه

**دابەڕزین** / dabeřzîn/: ☜ **دابەڕزان**

**دابەز** / dabez/: ناو. کـار و ڕەوتی دابـەزین ‹هـەر

هەڵبەزێ، دابەزێکی هەیە› 🇮🇷 فرود

**دابەزان** / dabezan/: ☜ **دابەزین**

**دابەزانـدن** / dabezandin/: چـاوگ. داوزانـــدن؛ داوزانن؛ داوەزاندن: ١. داخۆزاندن؛ پیـادە کـردن ٢. کـەم کردنـەوە؛ هێنانـەوە خـوار ٣. داگـرتن؛ دانلۆد کـردن 🇮🇷 ١. پیـادە کـردن ٢. فروکاسـتن ٣. دانلود کردن

**دابـەزین** / dabezîn/: چـاوگ. دابـەزان؛ داوزیـان؛ داوزیـــن؛ داوەزیـــن؛ داوەزان؛ داوەزیـــان: ١. داخۆزان؛ داخۆزیان؛ داخۆزین؛ داخۆسـتن ‹سـەد وەکوو ڕۆستەم بە دڵ، قەمچی لە ڕەخشی دا، بـەزی/ وەک گەییشـتە خەنـدەکی پایـانی عـومری دابـەزی «حاجی قادر»› ٢. هاتنە خوارەوە ‹ئێمـە نوێنـەری خەباتی ڕۆژهەلات/ ڕۆژهەلاتی سووری ئـاگرین/ فێـر نەبووین بەزین و دابـەزین «سـوارە»› ٣. داگیریـان؛ دانلۆد بـوون 🇮🇷 ١. پیـادە شـدن ٢. پـایین آمـدن ٣. دانلود شدن

**دابەستن** / dabestin/: چاوگ. دابێنان؛ داوەسـتن: ١. قایم کردن؛ شەتەک دان؛ شەداندن ٢. قامەت بەسـتن؛ دەسـپێکردنی نـوێژ و نیـەت ‹نـوێژی دابەسـت› ٣. پـەروار خسـتن؛ حـەیوان لـە مـاڵ ڕاگرتن بۆ قەڵەو بوونی ‹غەم مەخۆ قوربان! لـە بـۆ قوربانی عەیدی وەسلی تۆ/ مودەیێکـە بـەو ئومێـدە، حاجی خـۆی دابەسـتووە «حـاجی قـادر»› ٤. تونـد لێک بەستن (وەک: توند بەستنی نـێر و ئـاموور لـە سەر ملی گا و ئامـادەی جـووت بـوون) ‹جووتەکـەم دابەست› ٥. *[پلار]* ڕاگرتنی منداڵ یا کەسی‌تـر لـە ماڵەوە و کار پێ نـەکردنی ٦. شەڕەقسـە کـردن ‹لەگەڵـم دامەبەسـتە/ دەمـت دەڵـێی مەقەسـتە! «مەتـەڵ»› ٧. *[مەجاز]* بەسـتن؛ زینـدانی کـردن ‹چۆن دەبێ سەربەسـت گـەلی ژێردەسـت کـە کـچ دابەستە بێ/ بەس نەبێ ئەو کۆیلـەتی و ئـەو کـچ لـە ژوور دابەستنە؟! «هـێمن»› 🇮🇷 ١. مُحکـم بسـتن ٢. اقامه کردن نماز ٣. پروار بستن ۴. خیش را مُحکم بـه گاو بستن ۵. تنبل بار آوردن ۶ جدال لفظی کردن ۷. زندانی کردن

**دابەستو** / dabestû/: ☜ **دابەستە**

**دابەستە** / dabeste/: ئاوەڵناو. دابسـتە؛ دابەسـتوو؛ دابەسیاگ؛ ڕەپیتە؛ هەملک؛ پەروار؛ بەن؛ چـاخ و گۆشتن لە بەر خزمەت و خـۆراکی بـاش ‹بـەنی دەسرازەت خوری شەکی کاڵ/ دابەستەی کوێسـتان چراگای سەریاڵ «قانع»› 🇮🇷 پروار

**دابەسیاگ** / dabesyag/: ☜ **دابەستە**

**دابەش** / dabeş/: ناو. بەش؛ داڵبەخش؛ داڵـبەش: ١. کار و ڕەوتی بەش کردن ٢. *[ریازی]* یەکێک لە چوار کارە سەرەکییەکان، بۆ زانـینی ئـەوەی کـە هەندێک چەند جار لە یەکێکی‌تردا هەیە 🇮🇷 ١و٢. تقسیم

◻ **دابەش بـون**: ١. جوێ- جـوێ و بـەش- بـەش بوون ٢. بەش بوونەوە 🇮🇷 ١. قطعه- قطعه شـدن ٢. تقسیم شدن

**دابەش کردن**: بـەش کردنـەوە ‹کـە حـەجاجی فەلەک هات و بە خوێنی غەم خەلاتی کرد/ بەسەر شـێخ و مـەلادا دابەشـی مووچـە و بـەراتی کـرد «بێخود»› 🇮🇷 تقسیم کردن

**دابەش دابەش** / dabeşdabeş/: ئاوەڵناو. پارچە-پارچە؛ جیا ـ جیا 🇮🇷 تکه ـ تکه

**دابـــەش‌کراو** / dabeşk(i)raw/: ئاوەڵـــناو. ١. پارچـــە-پارچـــەکراو؛ لـــەت ـ لـــەت‌کـــراو ٢. بـــەش-بـــەش‌کـــراو 🇮🇷 ١. تکـــە- تکـــە شـــدە ٢. تقسیم‌شده

**دابەش‌کەر** / dabeşker/: ناو. ١. کەسێ کـە شـتێ بەش دەکاتەوە ٢. کەسێ کە شتێ بـەش- بـەش دەکا ‹دابەشکەری سارد و گەرمی ناو لەش/ چی بـۆ چی دەبێ لەوێ دەدا بەش «هەژار، *مـەم‌وزیـن*»› 🇮🇷 ١. توزیع‌کننده ٢. تقسیم‌کننده

**دابەشین / dabeşîn/:** چاوگ. دابەشینەوە؛ بەش‌کردنەوە؛ دابەش کردن ‹نابینی زەردە لەسەر لێوی کەسێ لەم شارەدا/ گەر خەم و دەردی دڵی خۆمیان بەسەردا دابەشم «هێمن»› ☰ توزیع کردن

**دابەشینەوە / dabeşînewe/:** ☜ **دابەشین**

**دابەلاندن / dabelandin/:** چاوگ. دابلاندن؛ دابەلیاندن؛ دابەلین؛ قووت/ قویت دان ☰ قورت دادن؛ فرودادن

**دابەلیاندن / dabelyandin/:** ☜ **دابەلاندن**

**دابەلین / dabelîn/:** ☜ **دابەلاندن**

**دابین[1] / dabîn/:** ناو. ١. کار و ڕەوتی پێک‌هاتن و مسۆگەر بوون ‹پەڵوپۆی زۆربەی مرۆ، بۆ دابینی بژیوە› ٢. دڵنیایی؛ ئاسوودەیی؛ دۆخی نەبوونی مەترسی ‹دابینی هەموو داهاتمان لەبەرچاوە› ٣. بیمە؛ بڕیارنامەیەک کە لە سۆنگەیدا، لایێک لە پێناو مزێکی دیاریکراوەوە بە لایەکی‌تر گفت دەدا کە ئەگەر بە هۆی کارەساتێکەوە زیانێکی لێ‌کەوت بۆی قەرەبوو بکاتەوە ☰ ١. تأمین ٢. خاطرجمعی ٣. بیمە

▣ **دابین کردن:** ١. پێک‌هێنان ‹دەستوبردێ شنەبام بۆ زین کە/ جێم لەگەڵ خۆت لە هەیڤ دابین کە «هەژار، *بۆ کوردستان*»›. هەروەها: **دابین بوون** ٢. بیمە کردن ☰ ١. فراهم آوردن ٢. بیمە کردن

**دابین[2]:** ئاوەڵناو. ١. ساز؛ مسۆگەر؛ وەبەرهاتوو ٢. *[مەجاز]* دڵنیا؛ بێ‌کێشە؛ خاترجەم ☰ ١. فراهم ٢. خاطرجمع

**دابیندانەر / dabîndaner/:** ☜ **دابینیار**

**دابینکار / dabînkar/:** ناو. بیمەکار؛ بیمەدەر؛ کەس یان دامەزراوەیەک کە بیمە دەکاتەوە ☰ بیمەگر

**دابینکەر / dabînker/:** ناو. پێکهێنەر؛ جۆرکەر ☰ تهیەکنندە

**دابیننامە / dabînname/:** ناو. بیمەنامە؛ نووسراوەی نێوان دابینکار و دابینیار ☰ بیمەنامە

**دابینی / dabînî/:** ناو. هێمنایەتی؛ دڵنیایی؛ ئارخەیانی ☰ امنیت

**دابینیار / dabînyar/:** ناو. دابین‌دانەر؛ کەسێ کە گیان یان ماڵی بە لای بیمەکارەوە بیمە دەکا ☰ بیمەگزار

**دابێتن / dabêtin/:** ☜ **دابێژان**

**ـ دابێژ / dabêj-/:** پاشەوشە. دابێژەر ‹ئارددابێژ› ☰ ـ بیز

**دابێژان / dabêjan/:** چاوگ. دابێژتن؛ دابێژاندن؛ بێژتن؛ دابێتن ‹بێژنگی لە دەس دەرێنە بەس دابێژێ!/ کەللەی سەری مەزن و پاتشا و میر و وەزیر «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ☰ بیختن

**دابێژاندن / dabêjandin/:** ☜ **دابێژان**

**دابێژتن / dabêjtin/:** ☜ **دابێژان**

**دابێژتنەوە / dabêjt(i)newe/:** چاوگ. ڤەبێتن؛ دیسان لە هێلەک دانەوە (ئارد و ...) ☰ دوبارە بیختن

**دابێژتە / dabêjte/:** ☜ **دابێژراو**

**دابێژ ـ دابێژ / dabêj dabêj/:** ئاوەڵناو. کون‌ـ‌کون ‹نیگای چاوی، بزەی لێوی، برینی دەکردم سارێژ/ برینی ئەو دڵەی دوژمن، بە تیر دەیکرد دابێژ‌ـ‌دابێژ «هێمن»› ☰ سوراخ ـ سوراخ

**دابێژران / dabêjran/:** چاوگ. لە بێژنگ دران ☰ بیختە شدن

**دابێژراو / dabêj(i)raw/:** ئاوەڵناو. دابێژتە؛ بە بێژنگ بێژراو ☰ بیختە

**دابێژەر / dabêjer/:** ناو. ئەوەی کاری دابێژتنە؛ کەسێ کە ئارد یان دەخڵ لە هێلەگ دەدا ☰ غربال‌کنندە

**دابێنان / dabênan/:** ☜ **دابەستن**

**داپ / dap/:** ☜ **داب‌ـ١**

**داپاچ / dapaç/**: ناو. ڕۆپل؛ هەڵپیت؛ کاری قرتاندن و سەرگوڵ و سەرلق کردنی پەل‌وپۆی دار و گیا ⚑ هَرَس

**داپاچان / dapaçan/**: ☜ **داپاچران**

**داپاچاندن / dapaçandin/**: ☜ **داپاچین ـ١**

**داپاچران / dapaçran/**: چاوگ. داپاچیان؛ داپاچان؛ تراشران و لووس بوون ‹دارەکان هەموو داپاچران› ⚑ تراشیده شدن؛ پیراسته شدن

**داپاچیان / dapaçyan/**: ☜ **داپاچران**

**داپاچین / dapaçîn/**: چاوگ. ١. داپاچاندن؛ بە تەور یان بە تیخ شتێ لە سەرەوە بۆ خوار بڕین، لق و پۆ لێ کردنەوە و لووس کردنی ‹دارەکانمان داپاچی› ٢. *[کینایی]* قەڵت‌وبڕ کردن؛ بە شیر و خەنجەر تێ‌کەوتن و خەڵک کوشتن ‹وتمان ئەم زوڵمە لە سەرمان لاچێ/ کورد ئیتر ناچێ یەکتر داپاچێ «هەژار، بۆ کوردستان»› ⚑ ١. تراشیدن و صاف کردن ٢. قلع‌وقمع کردن

**داپالوین / dapalwîn/**: ☜ **داپاڵین ـ١**

**داپاڵین / dapałîn/**: چاوگ. داپلاندن: ١. داپالوین؛ پالاوتن؛ پاڵفتە کردن ٢. داتکاندن؛ داتکانن؛ تکانن؛ بە تنۆک تکاندن ⚑ ١. تصفیه کردن ٢. قطره‌ـ قطره چکاندن

**داپچڕان / dapiçřan/**: چاوگ. ١. لە سەرەوە بۆ خوار دڕان ‹کراسەکەی بەری داپچڕابوو› ٢. *[پەلار]* زەق و گوشاد بوون ‹چاو داپچڕان؛ زار داپچڕان› ⚑ ١. از بالا به پایین پاره شدن ٢. خیره/ باز شدن

**داپچڕاندن / dapiçřandin/**: چاوگ. داپچڕین: ١. لە سەرەوە بۆ خوار دڕاندن ٢. *[پەلار]* داچەقاندنی دەم و زەق کردنی چاو ⚑ ١. از بالا به پایین پاره کردن ٢. باز کردن چشم و دهان

**داپچڕاو / dapiçřaw/**: ناو.ئـناو. دابڕاو؛ پساو ⚑ مُنقطع

**داپچڕین / dapiçřîn/**: ☜ **داپچڕاندن**

**داپچکوڕان / dapiçkûřan/**: چاوگ. ژاکان؛ بزرکان؛ زەرد هەڵگەڕان ⚑ پژمُرده شدن

**داپروسقان / dap(i)rusqan/**: ☜ **داپڕوزقان**

**داپروسقاندن/ dap(i)rusqandin/**: ☜ **داپڕوزقاندن**

**داپروسقانن / dap(i)rusqanin/**: ☜ **داپڕوزقاندن**

**داپروسقیان / dap(i)rusq(i)yan/**: ☜ **داپڕوزقان**

**داپرووسقانن / dap(i)rûsqanin/**: ☜ **داپڕوزقاندن**

**داپڕژان / dapiřjan/**: چاوگ. پرش و بلاو بوونەوە ⚑ پخش‌وپلا شدن

**داپڕژاندن / dapiřjandin/**: ☜ **داپژاندن**

**داپڕسکان / dap(i)ř(i)skan/**: ☜ **دابەڕزان**

**داپڕوزقان / dap(i)řuzqan/**: چاوگ. داپروسقان؛ داپروسقیان؛ داپروسکان؛ داپڕوزقیان؛ داپڕوزقین؛ داپرووسکان؛ داپروسکین؛ داپرووسکین؛ داپلۆسکان؛ ڕووت بوونەوەی وەک لکە دار یان هێشوو لە گەڵا و دەنک ‹بە کزەی بای زریان داران هەموو داپڕوزقان› ⚑ لُخت شدن از برگ و بر

**داپڕوزقاندن / dap(i)řuzqandin/**: چاوگ. داپروسقاندن؛ داپروسقانن؛ داپرووسقانن؛ داپڕوزقانن؛ داپروسکاندن؛ داپروسکانن؛ داپرووسکاندن؛ داپرووسکانن؛ داپلۆسکانن؛ ڕووت کردنەوەی وەک لک یان هێشوو لە گەڵا و دەنک ‹کزەی بای زریان دارانی هەموو داپڕوزقاند› ⚑ لخت کردن درخت از برگ و بر

**داپڕوزقانن / dap(i)řuzqanin/**: ☜ **داپڕوزقاندن**

**داپڕوزقیان / dap(i)řuzq(i)yan/**: ☜ **داپڕوزقان**

**داپڕوزقین / dap(i)řuzqîn/**: ☜ **داپڕوزقان**

**داپڕوسکان / dap(i)řuskan/**: ☜ **داپڕوزقان**

**داپڕوسکاندن/ dap(i)řuskandin/**: ☜ **داپڕوزقاندن**

**داپڕوسکانن / dap(i)řuskanin/**: ☜ **داپڕوزقاندن**

**داپڕوسکین / dap(i)řuskîn/**: ☜ **داپڕوزقان**

**داپڕووسکاندن/ dap(i)řûskandin/**: ☜ **داپڕوزقاندن**

**داپڕووسکانن / dap(i)řûskanin/**: ☜ **داپڕوزقاندن**

**داپڕووسکین / dap(i)řûskîn/:** ☜ **داپڕوزقان**

**داپـژان / dap(i)jan/:** چـاوگ. داپژیـان: ۱. بـەر بوونەوە و بڵاو بوونەوەی شـتی ورد ‹مووروووەکـان داپژان› ۲. پرش و بڵاو بوون ‹ماڵـەکە داپـژاوە› ▤ ۱. پاشیده شدن ۲. بەهم ریختن

**داپژاندن / dap(i)jandin/:** چاوگ. داپڕژانـدن: ۱. بەردانەوە و بڵاو کردنەوەی شتی ورد ۲. پـرش و بـڵاو کـردن ‹هـەموو ماڵـەکەی داپژانـدووە› ▤ ۱. پاشیدن ۲. بەهم ریختن

**داپژیان / dapijyan/:** ☜ **داپژان**

**داپسـکان / dapiskan/:** چـاوگ. داپســـکیان؛ داپســیان: ۱. بــە کــزی کروشمــە کــردن ۲. داتسیان؛ داتسـین؛ کـاری وەک فـس خـواردنی مریشک بۆ کەڵەشێر ▤ ۱. کِز کردن ۲. عمل مانند نشستن مرغ برای خروس

**داپسکیان / dapisk(i)yan/:** ☜ **داپسکان**

**داپسیان / dapisyan/:** ☜ **داپسکان**

**داپلاندن / dap(i)landin/:** ☜ **داپاڵین**

**داپلانن / dap(i)lanin/:** چاوگ. تلانن؛ تلانـدن ▤ غلتاندن

**داپـڵان / dap(i)łan/:** چـاوگ. درکـان؛ کەوتنــە دەرەوەی نهێنییەک ▤ درز کردن

**داپڵانـدن / dap(i)łandin/:** چـاوگ. درکانـــدن؛ دەربڕین ▤ فاش کردن

**داپڵۆخـان / dap(i)łoxan/:** چـاوگ. داپڵــۆخین؛ داپڵۆسان: ۱. دافرەقـان؛ دافـرەقین؛ دافرەقیـان؛ دافەتان؛ دافەتین؛ پێست فڕێ دان لە سووتان ۲. *[کینایە]* بـە تونـدی سـەرکۆنە یـان تـەمێ کـردن ‹کابرای وا داپڵـۆخاند، دیوەخـانی لـێ بـوو بـە کونە مشک› ▤ ۱. سوختن و افتادن پوسـت ۲. بـە شـدت سرزنش یا تنبیه کردن

**داپڵۆخانـــدن / dap(i)łoxandin/:** چــــاوگ. داپڵۆســاندن: ۱. دافرەقــانن؛ ســووتاندن و لــێ کردنــەوەی پێســت ‹ئاوەکولــەکە هــەموو گیــانی داپڵۆخاند› ۲. *[کینایە]* لە دەسـت و زمـان خسـتن ‹هێندەی لێ دا، داپڵۆخاند› ۳. *[کینایە]* بـە تونـدی سەرکۆنە کردن ‹کابرای وا داپڵۆخاند کونەمشکی لێ کردە عیمارەت› ▤ ۱. سوزاندن و پوست را کنـدن ۲. نیمەجان کردن ۳. سخت سرزنش تنبیه کردن

**داپڵۆخـاو / dap(i)łoxaw/:** ئاوەڵـناو. داپڵـــۆخیو؛ دافەتاو؛ پێسـت دامـاڵاو بـە هـۆی سـووتانەوە ▤ پوست انداخته از سوختگی

**داپڵۆخین / dap(i)łoxîn/:** ☜ **داپڵۆخان**

**داپڵۆخیو / dap(i)łoxîw/:** ☜ **داپڵۆخاو**

**داپڵۆسـان / dap(i)łosan/:** چـاوگ. داپڵۆســین؛ داپەڵۆسان؛ داپەڵۆسین؛ پڵۆسین؛ پڵۆسیایەرە: ۱. داپڵـۆخان؛ پێسـت فـڕێ دان لـە سـووتان ۲. دارکاری کرانی خەسـت و لـە سـەر یـەک ▤ ۱. سوختن و افتادن پوست ۲. سخت کتک خوردن

**داپڵۆســـاندن / dap(i)łosandin/:** چــــاوگ. داپڵۆســتن؛ داپەڵۆســاندن؛ پڵۆســنایەرە: ۱. داپڵۆخاندن ۲. دارکاری کردنی خەست و لە سەر یەک ▤ ۱. سـوزاندن و پوسـت را کنـدن ۲. سخت کتک زدن

**داپڵۆستن / dap(i)łostin/:** ☜ **داپڵۆساندن**

**داپڵۆسکان / dap(i)łoskan/:** ☜ **داپڕوزقان**

**داپڵۆسکانن / dap(i)łoskanin/:** ☜ **داپڕوزقاندن**

**داپڵۆسکیان / dap(i)łosk(i)yan/:** چاوگ. ڕووتەوە بوونی لک یان هێشوو لە گەڵا و دەنـک ▤ لُخـت شدن شاخه یا خوشه از برگ و دانه

**داپڵۆسین / dap(i)łosîn/:** ☜ **داپڵۆسان**

• **داپۆش / dapoş-/:** پاشەوشە. داپۆشـەر ‹قژداپـۆش؛ سەرداپۆش› ▤ ـ پوش

**داپۆشـــان / dapoşan/:** چـــاوگ. داپۆشـــاندن؛ داپۆشانن؛ داپۆشـتن؛ داپۆشـین: ۱. گرتنـە بـەر؛ داگرتن ‹تۆز ناوچەکەی داپۆشاوە› ۲. وەشارتن بـە

هۆی سەرپۆش لە سەر دانان ‹ڕۆژێ دێ گلی مـن و ئەوان بکرێ بە خشت/ تا گۆڕی هەژارێ تـری پـێ داپۆشن «هەژار، *چوارینەکانی خـەییام*»› ٣.*[کنایە]* سەر گرتن؛ تەواو کـردنی خـانوو ‹ماڵـەکەی تـازە داپۆشاوە› ٤.*[مەجاز]* پۆشینی سـڕ و نهـێنی ‹زۆر کارەسات ڕووی داوە و داپۆشاوە› 🇮🇷 ١. پوشـش دادن ٢. پوشاندن ٣. تمام کردن کار سـاختمان ۴. سـرپوش گذاشتن

**داپۆشاندن / dapoşandin**/: ☜ **داپۆشان**

**داپۆشانن / dapoşanin**/: ☜ **داپۆشان**

**داپۆشتن / dapoştin**/: ☜ **داپۆشان**

**داپۆشـران / dapoşran**/: چـاوگ. تێنەپـەڕ. نادیـار. //داپۆشـرای؛ دادەپۆشـرێی؛ داپۆشـرێ// داپۆشـیان؛ تەڤزین؛ نوخومان 🇮🇷 پوشیده شدن

■ ئاوەڵناوی بـەرکاری: داپۆشـراو/ چـاوگی نـەرێنی: دانەپۆشران

**داپۆشـراو / dapoşraw**/: ئاوەڵـناو. داپۆشـیاگ؛ بانٍدراو؛ وەشارتوو 🇮🇷 پوشانیده

**داپۆشەر / dapoşer**/: نـاو. ئـەوەی دادەپۆشـێ 🇮🇷 پوشاننده

**داپۆشیاگ / dapoşyag**/: ☜ **داپۆشراو**

**داپۆشیان / dapoşyan**/: ☜ **داپۆشران**

**داپۆشین / dapoşîn**/: ☜ **داپۆشان**

**داپۆشینەوە / dapoşînewe**/: چـاوگ. دیسـانەوە داپۆشین 🇮🇷 بازپوشاندن

**داپۆکان / dapokan**/: ئاوەڵناو. پرووکان؛ پرتووکـان 🇮🇷 فرسوده شدن

**داپۆکاندن / dapokandin**/: چاوگ. پرتووکاندن 🇮🇷 فرسوده کردن

• **داپەچن / dapeçin**/: پاشەوشە. قووتدەر 🇮🇷 بلعنده

**داپـەچنین / dapeçnîn**/: چـاوگ. قـووت دان 🇮🇷 بلعیدن

**داپـەچین / dapeçîn**/: چـاوگ. قـووت چـوون 🇮🇷 فروشدن در گلو

**داپەڕ[1] / dapeř**/: نـاو. کـار و ڕەوتی بزووتنـەوە بـە چالاکی 🇮🇷 اقدام سریع

**داپەڕ[2]**: پێرۆ. ← **هەڵپەڕ ـ داپەڕ**

**داپەڕان / dapeřan**/: ☜ **داپەڕین**

**داپـەڕانـدن / dapeřandin**/: چـاوگ. بـاز پـێدان بەرەوخوار 🇮🇷 به پریدن واداشتن

**داپەڕژاندن / dapeřjandin**/: چـاوگ. لـە سـەرەوە هەڵداشتن (ئاو و تراوی تر) 🇮🇷 از بالا پاشیدن

**داپەڕژنین / dapeřj(i)nîn**/: چاوگ. هەڵـپەرتاوتن؛ هەڵپاچینی لک و پۆپی دار 🇮🇷 هرس کردن درخت

**داپەڕین / dapeřîn**/: چـاوگ. داپەڕان: ١. باز بردن بـەرەوە خـوار ٢. سـەر بـەرەژێر بلـەز چـوون ٣. داچلەکان؛ ڕاپەڕین 🇮🇷 ١. پایین پریدن ٢. با شـتاب فروآمدن ٣. از خواب پریدن

**داپەڵۆسان / dapełosan**/: ☜ **داپلۆسان**

**داپەڵۆساندن / dapełosandin**/: ☜ **داپلۆساندن**

**داپەڵۆسین / dapełosîn**/: ☜ **داپلۆسان**

**داپەنـەمان / dapeneman**/: چـاوگ.*[پـڵار]* داپەنەمین؛ دانیشتن و بێدەنگ بوون 🇮🇷 تمرگیدن

**داپەنەمین / dapenemîn**/: ☜ **داپەنەمان**

**داپیـتن / dapîtin**/: چـاوگ. هەڵـپەرتاوتن؛ هەڵپاچینی لک و پۆپی دار 🇮🇷 هرس کردن درخت

**داپیر / dapîr**/: ناو. داپیرک؛ داپیرە؛ نـەنک؛ نەنـە؛ نەنێ؛ دایەگەورە 🇮🇷 مادربزرگ

**داپیرک / dapîrik**/: ☜ **داپیر**

**داپیرۆشـک / dapîroşk**/: نـاو. ١. جالجالـۆکە؛ جاوتەنە ٢. پیرایشـۆکە؛ داپیرۆکـە؛ کەرەکەولـە؛ مێروویەکی بۆر و خڕکەڵە، بە لەشی ئالقەـ ئالقە، بێ قاپوولکە و زگی کورت و پێی بڵـند و زۆرەوە، گڵ لە سەر کونەکەی هەڵدەداتەوە 🇮🇷 ١. عنکبوت ٢. خرخاکی

**داپیرۆکـە / dapîroke**/: نـاو. پیرۆشـک؛ خلێـرە؛

داپیرۆشک ≡ خرخاکی

**داپیره / dapîre/:** ☜ **داپیر**

**داپێچاندن / dapêçandin/:** چاوگ. داپێچانن؛ داپێچین: ١. شەتەک دان؛ توند بەستن ٢. ڕەپێچەک دان؛ بەرخۆدان و ڕاڕفاندن ≡ ١. مُحکم بستن و گره زدن ٢. با فشار به جلو راندن

**داپێچانن / dapêçanin/:** ☜ **داپێچاندن**

**داپێچران / dapêçran/:** چاوگ. داپێچیان: ١. شەتەک دران؛ توند بەسترانەوە ٢. ڕەپێچەک دران؛ بەرخۆدران و ڕاڕفێندران ≡ ١. مُحکم بسته شدن ٢. با فشار به جلو رانده شدن

**داپێچیان / dapêçyan/:** ☜ **داپێچران**

**داپێچین / dapêçîn/:** ☜ **داپێچاندن**

**داتاش / dataş/:** ناو. تاشەر ≡ تراشنده

**داتاشان / dataşan/:** ☜ **داتاشین**

**داتاشران / dataşran/:** چاوگ. داتاشیان؛ داتراشان: ١. تاشران لە سەرەوە بۆ خوار ٢. *[پلار]* هەڵبەستران؛ بێ بنەما دروست بوون ‹ئەم قسانە هیچیان ڕاست نین و هەموو داتاشراون› ≡ ١. از بالا به پایین تراشیده شدن ٢. جعل شدن

**داتاشیان / dataşyan/:** ☜ **داتاشران**

**داتاشین / dataşîn/:** چاوگ. داتاشان؛ داتراشاندن: ١. تاشین لە سەرەوە بۆ خوار ٢. *[پلار]* هەڵبەستن؛ لە هیچ دروست کردن ٣. چێ کرن و تاشینی پەیکەر ٤. *[زمان]* کاری ڕۆنانی وشەی نوێ لە تێکەڵ کردنی لەتوکوتی چەن وشە ≡ ١. از بالا به پایین تراشیدن ٢. از خود بافتن؛ جعل کردن ٣. مجسمه ساختن ۴. واژه ساختن

**داتراشان / dat(i)raşan/:** ☜ **داتاشران**

**داتراشاندن / dat(i)raşandin/:** ☜ **داتاشین**

**داترووسکان / dat(i)rûskan/:** چاوگ. داترووسکیان؛ داتورووسکان؛ داتورووسکیان؛ داچڵەکیان؛ ڕاچەنین لە ترسان ≡ یکه خوردن

**داترووسکاندن / dat(i)rûskandin/:** چاوگ. ڕاچەناندن؛ داچڵەکاندن؛ داتورووسکانن ≡ شُکه کردن

**داترووسکیان / dat(i)rûsk(i)yan/:** ☜ **داترووسکان**

**داتسیان / datisyan/:** ☜ **داتسین**

**داتسین / dat(i)sîn/:** چاوگ. داتسیان: ١. داهاتن نزیک بە ڕووخان ‹ئەو دیوارە داتسیاگە› ٢. داپسکان؛ فس خواردنی مریشک بۆ کەڵەشێر ≡ ١. کج شدن و در شرف افتادن بودن ٢. نشستن مرغ برای خروس

**داتکان / dat(i)kan/:** چاوگ. تکیان؛ تکە کردن؛ تکایەرە؛ دڵۆپەـدڵۆپە هاتنە خوار ≡ چکیدن

**داتکاندن / dat(i)kandin/:** چاوگ. داتکانن: ١. بە دڵۆپ ڕژاندن بەرە خوار ٢. *[کنایە]* دۆشین ‹با بچم ئەو چەپاڵە مانگا داتکێنم› ≡ ١. چکاندن ٢. دوشیدن

**داتکانن / dat(i)kanin/:** ☜ **داتکاندن**

**داتلیشان / dat(i)łîşan/:** چاوگ. داتلیشیان: ١. شڕ بوون لە سەرەوە بۆ خوار ٢. لە شوێنێکەوە توند بەرەو خوار هاتن ≡ ١. شکافته شدن از بالا به پایین ٢. به سرعت پایین آمدن

**داتلیشاندن / dat(i)łîşandin/:** چاوگ. داتلیشانن؛ قەڵاشتن؛ لە سەرەوە بۆ خوار دڕاندن ≡ از بالا تا پایین شکافتن

**داتلیشانن / datłîşanin/:** ☜ **داتلیشاندن**

**داتلیشاو / dat(i)łîşaw/:** ناوەڵناو. داتلیشیاگ؛ دڕاو لە سەرەوە بۆ خوار ≡ از بالا تا پایین شکافته شده

**داتلیشیاگ / dat(i)łîşyag/:** ☜ **داتلیشاو**

**داتلیشیان / dat(i)łîşyan/:** ☜ **داتلیشان**

**داتورووسکان / daturuskan/:** ☜ **داترووسکان**

**داتورووسکانن / daturuskanin/:** ☜ **داترووسکاندن**

**داتوروسکیان** / daturusk(i)yan/: ☜ **داتروسکان**

**داتولان** / datułan/: ☜ **تولانەوە**

**داتولاو** / datuław/: ناوەڵناو. لە بەر یەک چوو بە هۆی کولانی زۆر ■ لە شدە از زیاد پختن

**داتولین** / datułîn/: ☜ **تولانەوە**

**داتۆلان** / datołan/: چاوگ. تۆلانەوە؛ نەرم بوون بە هۆی زۆر گەیینەوە (میوە و ...) ■ نرم شدن به علت زیاد رسیدن (میوه و ...)

**داتۆلاندن** / datołandin/: چاوگ. لەبەر یەک بردن بە هۆی زۆر کولاندنەوە ■ لە کردن از بسیار پُختن

**داتووڕاندن** / datûřandin/: چاوگ. فیڕاندن؛ تووڕاندن؛ پیسی شل ڕیان ■ اسهالی ریدن

**داتووکان** / datûkan/: چاوگ. *[پلار]* هەڵترووشکان ■ چُمباتمه زدن

**داتەپان** / datepan/: ☜ **داتەپین**

**داتەپاندن** / datepandin/: چاوگ. کوتانەوە (بە بێڵ و ...) ■ کوبیدن (با بیل و ...)

**داتەپاو** / datepaw/: ناوەڵناو. داتەپیاگ: ١. ڕۆچوو؛ قوپاو؛ قووپاو ٢. کوتێنراو ٣. *[پلار]* کورتەبالای قەڵەو ■ ١. فروریخته ٢. کوبیده‌شده ٣. کوتوله‌ی چاقالوو

**داتەپکین** / datepkîn/: ☜ **داتەپین**

**داتەپیاگ** / datepyag/: ☜ **داتەپاو**

**داتەپین** / datepîn/: چاوگ. داتەپان؛ داتەپکین: ١. داڕمین؛ داڕووخان؛ ڕمان؛ ڕووخان ‹قەسری عومرم داتەپی داری لەسەر بەردی نەما/ بانییە تووڵی ئەمەڵ ئیستێکە دەستی پێ دەکا! «حاجی قادر»› ٢. قوپانی سەربان ‹بەو بارانە سەربانەکە داتەپی› ٣. *[پلار]* دانیشتن و بێدەنگ بوون ‹لە جێی خۆت داتەپە و دەنگت نەیە!› ■ ١. فروریختن ٢. فرو رفتن بام ٣. تمرگیدن

**داتەپیو** / datepîw/: ناوەڵناو. ڕۆچوو؛ قوپاو ■ نشست‌کرده

**داتەخرین** / datexrîn/: چاوگ. داکوژان؛ نەمان ‹بەرە بەرە شەڕ ژی داتەخری› ■ فروکش کردن

**داتەڤن** / datev(i)n/: ☜ **دارتەون**

**داتەقان** / dateqan/: چاوگ. بە پەلەپەل دابێژران ■ با عجله بیخته شدن

**داتەقاندن** / dateqandin/: چاوگ. دابێژتنی بە پەلەپەل ■ با عجله بیختن

**داتەقانن** / dateqanin/: ☜ **داکوتان ـ٣**

**داتەقیان** / dateqyan/: ☜ **داکوتران ـ٢**

**داتەک** / datek/: ناو. داڵنگ؛ قانوون؛ یاسا ■ قانون

**داتەکان** / datekan/: چاوگ. داتەکیان؛ داتەکین؛ سەر بەرەو خوار ڕاوەشان ■ تکاندن

**داتەکاندن** / datekandin/: چاوگ. داتەکانن؛ لە سەرەوە بۆ خوار ڕاوەشاندن بە مەبەستی پێوە نەهێشتنی شتی سەری ■ فروتکاندن

**داتەکانن** / datekanin/: ☜ **داتەکاندن**

**داتەکاو** / datekaw/: ناوەڵناو. داتەکیو؛ داتەکیاگ؛ داتەکی؛ ڕاوەشاو لە سەرەوە بۆ خوار ■ فروتکانیده شده

**داتەکی** / datekî/: ☜ **داتەکاو**

**داتەکیاگ** / datekyag/: ☜ **داتەکاو**

**داتەکیان** / datekyan/: ☜ **داتەکان**

**داتەکین** / datekîn/: ☜ **داتەکان**

**داتەکیو** / datekîw/: ☜ **داتەکاو**

**داتەمراندن** / datemrandin/: لە جووڵە خستن؛ تەکان بڕین ■ از حرکت انداختن

**داتەمریاگ** / datem(i)ryag/: ☜ **دامرکاو**

**داتەمریان** / datem(i)ryan/: ☜ **دامرکان**

**داتەمیان** / datem(i)yan/: ☜ **داتەمین**

**داتەمین** / datemîn/: چاوگ. داتەمین؛ خەمبار بوون؛ تەم و مەینەت داگرتن ■ افسُردن

**داجرتاندن** / dacirtandin/: ☜ **دافرتانن ـ٢**

**داجمان** / dac(i)man/: چاوگ. وه ڕێ کەوتن ✉ راه افتادن؛ به حرکت افتادن

**داجماندن** / dac(i)mandin/: چاوگ. وه ڕێ خستن ✉ حرکت دادن؛ به حرکت انداختن

**داجوین** / dac(i)wîn/: چاوگ. بزووتنەوە؛ جوولان ✉ جُنبیدن

**داچاندن** / daçandin/: چاوگ. ١. داوەشاندن؛ تۆم بە زەوییەوە کردن ٢. کەم-کەم و خوەش-خوەش ئارد بە سەر ڕۆندا کردن ✉ ١. بذر کاشتن ٢. آرد بر روغن تفته ریختن

**داچزان** / daç(i)zan/: چاوگ. چزان؛ ئەندام بە ویکەوتنی ئاگر سووتان ✉ سوختن بدن از تماس مستقیم با آتش

**داچزاندن** / daç(i)zandin/: چاوگ. داخ کردن؛ داغ بە ئەندامی لەشەوە نان ✉ داغ کردن

**داچکان** / daç(i)kan/: چاوگ. داچکیان: ١. داتکان؛ تکانە خوارەوە ٢. نم لێ بڕان و وشک بوون ٣. هەڵواسران؛ دالەقان ٤. داچەقان؛ تێڕاچوون ✉ ١. چکیدن ٢. خشکیدن ٣. آویخته شدن ۴. فرورفتن

**داچکاندن** / daç(i)kandin/: چاوگ. ١. داتکاندن ٢. نم لێ بڕین ٣. هەڵواسین؛ دالەقاندن ٤. چەقاندن؛ تێڕا کردن ✉ ١. چکاندن ٢. خُشک کردن ٣. آویختن ۴. فروکردن

**داچکە** / daç(i)ke/: ناو. جاچکە؛ بنێشت ✉ سقّز

**داچکیان** / daçikyan/: ☜ **داچکان**

**داچکیلان** / daç(i)kîlan/: چاوگ. چەقان؛ چەقیان ✉ فرورفتن

**داچکیلاندن** / daç(i)kîlandin/: چاوگ. چەقاندن؛ چەقانن ✉ فروبردن

**داچڵەکان** / daç(i)łekan/: چاوگ. داچڵەکیان؛ داچڵەکین؛ ڕاچڵەکین: ١. تەکان خواردن لە ترسان یان لە خەبەری سەمەرە ٢. لە نەکاو لە خەو هەستان ✉ ١. یکّه خوردن ٢. از خواب پریدن

**داچڵەکاندن** / daç(i)łekandin/: چاوگ. داچڵەکانن؛ ڕاچڵەکاندن: ١. بوونە هۆی تەکان خواردن ٢. لە ناکاو لە خەو وەخەبەر هێنان ✉ ١. شُکه کردن ٢. ناگهانی بیدار کردن

**داچڵەکانن** / daç(i)łekanin/: ☜ **داچڵەکاندن**

**داچڵەکاو** / daç(i)łekaw/: ئاوەڵناو. داچڵەکیو؛ داچڵەکیاگ: ١. شڵەژاو؛ لە نەکاو لەرزیو لە ترسان یان لە خەبەری سەیر و سەمەرە و ناخۆش ٢. لە نەکاو وەخەبەر هاتوو ✉ ١. یکّه‌خورده ٢. از خواب پریده

**داچڵەکیاگ** / daç(i)łekyag/: ☜ **داچڵەکاو**

**داچڵەکیان** / daç(i)łekyan/: ☜ **داچڵەکان**

**داچڵەکین** / daç(i)łekîn/: ☜ **داچڵەکان**

**داچڵەکیو** / daç(i)łekîw/: ☜ **داچڵەکاو**

**داچمان** / daç(i)man/: چاوگ. ڕاپەڕین؛ هەستانەوە ✉ برخاستن

**داچماندن** / daç(i)mandin/: چاوگ. ڕاپەڕاندن؛ هەستاندنەوە ✉ برخیزاندن

**داچناندن** / daç(i)nandin/: چاوگ. ١. چنینەوە؛ کۆکردنەوە ٢. هەڵکردن؛ هەڵپێچان (وەک قۆڵ و داوێن) ✉ ١. چیدن ٢. جمع کردن

**داچناو** / daç(i)naw/: ئاوەڵناو. داچنراو؛ داچەندراو؛ داچەنراو؛ داچێندراو؛ داچێنراو؛ تۆو پێوەکراو ✉ پاشیده شده (بذر)

**داچنراو** / daçinraw/: ☜ **داچناو**

**داچنیان** / daçinyan/: چاوگ. داچێندران؛ داچێنران: ١. ڕیز بوونی شت بە تەنیشت یەکەوە بە ڕێکوپێکی ٢. لە سەر یەک هەڵچنران ٣. هەڵپێچران؛ بەستران ٤. داپژیان؛ پرژوبڵاو بوون ✉ ١. کنار هم چیده شدن ٢. روی هم چیده شدن ٣. بسته شدن ۴. به هم ریختن

**داچنین** / daç(i)nîn/: چاوگ. ١. ڕیز کردنی شت

بە تەنیشت یەکەوە بە ڕێک‌وپێکی ۲. لە سەر یەک هەڵچنین ۳. هەڵپێچان؛ بەستن ٤. داپژاندن ‹تەواو ناو ماڵەکەی داچنیگە› ☰ ۱. پهلوی هم چیدن و مرتب کردن ۲. روی هم چیدن ۳. بستن ۴. به هم ریختن

**داچنیاگ** / daçinyag/: ئاوەڵناو. ڕژاو و پژاو؛ پرژوبڵاو ‹ناو ماڵ داچنیاگ› ☰ پخش و پلا؛ بەهم‌ریخته

**داچۆڕان** / daçořan/: چاوگ. داچۆڕیان؛ داچۆڕین: ۱. تک ـ تک هاتنە خواری ئاو یان تراوی تر، لە سەرەوە ‹گیان! وچانێ لە سەر ئەم دوو گۆڕە/ دڵە خوێن هەڵ بدە! چاو داچۆڕە! «هەژار، بۆ کوردستان»› ۲. وشک هەڵاتن (کانی و ...) ‹داچۆڕانی دوا تنۆکی زەردەخەنەی گاتاکان بوو «شێرکۆ»› ☰ ۱. چکیدن ۲. خشکیدن (چشمه و ...)

**داچۆڕاندن** / daçořandin/: چاوگ. داچۆڕانن: ۱. داچکاندن ۲. وشک کردن؛ بەتاڵ کردنی ئاو ☰ ۱. چکاندن ۲. خُشکاندن

**داچۆڕانن** / daçořanin/: ☜ داچۆڕاندن

**داچۆڕیان** / daçořyan/: ☜ داچۆڕان

**داچۆڕین** / daçořîn/: ☜ داچۆڕان

**داچوون** / daçûn/: چاوگ. ۱. نەوی بوون و قوپان ‹سەربانەکە داچووە؛ هەویرەکە داچووە› ۲. چەقین ‹زەوی قوڕ بوو، قاترەکە پای داچوو› ☰ ۱و۲. فرورفتن

**داچەقان** / daçeqan/: چاوگ. داچەقیان؛ داچەقین: ۱. *[پلار]* کرانەوەی دەم، چاو و... ۲. تێراچوون ۳. بە زەویدا چوون ☰ ۱. باز شدن دهان، چشم و... ۲. خلیدن ۳. فروشدن در زمین

**داچەقاندن** / daçeqandin/: چاوگ. داچەقانن: ۱. *[پلار]* کردنەوەی دەم، چاو و... ۲. تێراکردن ۳. بە زەویدا کردن ☰ ۱. باز کردن دهان، چشم و... ۲. خلاندن ۳. فروکردن در زمین

**داچەقانن** / daçeqanin/: ☜ داچەقاندن

**داچەقاو** / daçeqaw/: ئاوەڵناو. داچەقیاگ؛ داچەقیاو: ۱. وەکراوە ۲. ڕۆچوو ☰ ۱. باز گذاشته شده ۲. فروشده

**داچەقیاگ** / daçeqyag/: ☜ داچەقاو

**داچەقیان** / daçeqyan/: ☜ داچەقان

**داچەقیاو** / daçeqyaw/: ☜ داچەقاو

**داچەقین** / daçeqîn/: ☜ داچەقان

**داچەکان** / daçekan/: چاوگ. داچەکین: ۱. مل‌کز بوون ۲. ژاکان؛ پێچوون؛ سیس هەڵگەڕان ☰ ۱. افسُردن ۲. تکیدن

**داچەکاندن** / daçekandin/: چاوگ. مژین تا ئاخر دڵۆپ؛ دڵۆپ لێ‌بڕین ☰ تا آخرین قطره مکیدن

**داچەکاو** / daçekaw/: ئاوەڵناو. ۱. مل‌داخستوو لە کزی ۲. ژاکاو؛ سیس هەڵگەڕاو ☰ ۱. کِزکرده ۲. تکیده

**داچەکین** / daçekîn/: ☜ داچەکان

**داچەلاندن** / daçelandin/: چاوگ. داڵەقاندن؛ بەرەوژێر هەڵواسین؛ شۆڕەو کردن ☰ آویختن

**داچەمان** / daçeman/: چاوگ. داچەمین؛ چەمینەوە؛ چەمانەوە ☰ خمیدن

**داچەماندن** / daçemandin/: چاوگ. داچەمانن؛ کووڕ کردن ☰ خم کردن

**داچەماندنەوە** / daçemand(i)newe/: چاوگ. دانەواندنەوە؛ کۆمەو کردن؛ کۆم کردنەوە ☰ خم کردن

**داچەمانن** / daçemanin/: ☜ داچەماندن

**داچەماو** / daçemaw/: ئاوەڵناو. قۆز؛ کۆم ☰ کُوژ

**داچەمین** / daçemîn/: ☜ داچەمان

**داچەندراو** / daçend(i)raw/: ☜ داچناو

**داچەندن** / daçendin/: چاوگ. داچەنن؛ تۆم پژاندنە زەوی ☰ بذر افشاندن

**داچەنراو** / daçenraw/: ☜ داچناو

**داچەنن / daçenin/:** ☜ **داچەندن**

**ـ داچێن / daçên-/:** پاشەوشە. ـــ چـن؛ ـ چێن ‹تۆوداچێن› ☰ ـ کار

**داچێندران / daçênd(i)ran/:** ☜ **داچنیان**

**داچێندراو / daçênd(i)raw/:** ☜ **داچناو**

**داچێنران / daçênran/:** ☜ **داچنیان**

**داچێنراو / daçênraw/:** ☜ **داچناو**

**داحبا / daĥba/:** ☜ **دەعبا**

**داحلاندن / daĥ(i)landin/:** ☜ **داحەلاندن**

**داحەلانـدن / daĥelandin/:** چـاوگ. داحلانـــدن؛ داهێشتن؛ شۆڕ کردنەوە ☰ آویزان کردن

**داخ[1] / dax/:** ناو. داغ: ١. شوێنی چـزان لـە سـەر پێسـت بـە هـۆی شـتێکی داخـەوە ٢. درۆشـم؛ کەوی؛ سۆیەر؛ ئامرازێکی کانزایی بە نەخشێکەوە بۆ بە ئاگر چزاندن ٣. ئاسـەواری ڕووداوێکـی زۆر دڵتەزێن ‹خەسرەویت بێ‌سـەبـر ئـارام و خـەوەن/ پەشێویش جە داخ مەرگ خەسرەوەن «مەستوورە»› ٤. خەم؛ خەفەت؛ کەسەر ‹هیوا و ئاوات و تاسەیـە/ ئاخ و داخ و هەناسـەیـە «ئـاوات»› ٥. سـۆ؛ سـوێ؛ عەزرەت ‹فەڵەک داخ وە دڵ خەستەمدا بەردی/ ژار دووری گیـان ئـازیز پـێم وەردی «مەولـەوی»› ٦. بەیـداخ؛ دروشـم ☰ ١تـا ٣. داغ ٤. غـم؛ انـدوە ٥. حسرت ٦. آرم

▣ **داخی داخان** زۆر بـە داخـەوە ‹ئـارۆ ڕێم کەوتـە کەلی ئێشـکەهۆڵ/ داخـی داخانـم هەڵـەبجە بی چۆڵ «فولکلۆر»› ☰ دردا و حسرتا

**داخی دڵ** خەمێ کە لە بیر نەچێتەوە ☰ داغ دل

▣ **داخ بردنە دڵەوە** داخ نیانە بان دڵەوە؛ خەفەتی گەورە پێ دان ☰ داغ بر دل گذاشتن

**داخ پێدان** تووشی خەم و حەسرەت کـردن ☰ داغ بر دل نهادن

**داخ چوونە دڵەوە** تووشی خەمی گەورە بوون ☰ داغ بر دل نشستن

**داخ دیتن** تووشیاری کوڵ و کەسەری سـەخت بوون ☰ داغ دیدن

**داخ کردن** ١. کەواندن؛ ئارهاندن؛ بە کـانزا یـان شتێکی سوورەوە بوو لە سەر لەش شوێن دانان ٢. چۆقاندن/ قرچانـدنی ڕۆن ٣. *[کینایە]* فریـو دان و زیان پێ گەیاندن ☰ ١. داغ کردن ٢. تـف دادن روغن ٣. فریب دادن

**داخ لـە دڵ بـوون** تووشـــی خـــەمی گـــەورە و بێ‌بڕانەوە بوون ‹نەسرین دەمێکە داخت لە دڵمە/ گیرۆدەی بەندی، ژیانت زوڵمە «بێکەس»› ☰ داغ بر دل داشتن

**داخ نیانە بان دڵەوە** ☜ **داخ بردنە دڵەوە**

**داخی دڵ پێ‌ڕشتن** ڕق پـێ‌ڕشـتن بـە لێـدان و قسەی ناخۆش ☰ کینەی دل خالی کردن

**داخی شتێ لە سەر دڵی کەسێ مانەوە** ئاسـەواری خەمێکی ئەستەم پێ مانەوە ‹بابی مرد و داخـی خوێندن لە سەر دڵی مایەوە› ☰ داغ چیزی بە دل کسی ماندن

**داخ[2]:** ئاوەڵناو. داغ؛ سویر؛ زۆر گەرم ☰ داغ

▣ **داخ کردن** ١. زۆر گەرم کردنی هەوا. هەروەها: **داخ بوون** ٢. *[کینایە]* سـەر گـەرم بـوون؛ مـەس کردن ☰ ١. داغ کردن (هوا) ٢. مست شدن

**داخ[3]:** دەنگ. داخ؛ حەیف؛ مخابن ☰ دریغ

**داخ[4]:** پێرۆ. ← **شاخ و داخ**

**داخاز / daxaz/:** ☜ **داوخواز**

**داخازتن / daxaztin/:** ☜ **داخواستن**

**داخداخانم / daxdaxanim/:** ☜ **داخی‌داخانم**

**داخـدار / daxdar/:** ئاوەڵـناو. داغـــدار؛ خـــەمبار؛ دڵبکوڵ؛ زۆر خـەمین بـە هـۆی لـە دەس دانی کەسێ یان شتێکی خۆشەویستەوە ☰ اندوهبار

**داخدیـە / daxd(i)ye/:** ئاوەڵـناو. داغدیـە؛ تووشـی کـوڵ و کەسـەرێکی زۆر بـە هـۆی مـردنی خۆشەویستێکەوە ☰ داغدیدە

**داخــران / dax(i)ran/:** چــاوگ. داخریـــــان: ١. بەستران؛ بەسیان ٢. بەرهەڵدا کران؛ وێڵ کـران ≡ ١. بسته شدن ٢. رها شدن

**داخـراو / dax(i)raw/:** ئاوەڵـناو. داخریـــاگ: ١. بەسراو؛ پێوەدراو؛ قفڵ کـراو ‹دوکـانی داخـراو› ٢. ڕاخراو؛ داخریاگ ‹سفرەی داخـراو› ٣. سـەرگیراو ‹هۆڵی داخراوی گوڵان› ≡ ١. بسـته ٢. پهـن‌شـده؛ گسترده ٣. سرپوشیده

**داخراوه / dax(i)rawe/:** ئاوەڵکار. بەنهێنی؛ نـە بـە ڕاشـکاوی ‹دانیشـتنی ئەمـڕۆی پارلـەمان داخـراوە بەڕێوە چوو› ≡ غیرعلنی

**داخرپان / daxirpan/:** ☚ **داخورپان**

**داخرپیان / daxirp(i)yan/:** ☚ **داخورپان**

**داخرماندن / daxirmandin/:** چاوگ. داکرمانـدن؛ داکرۆژتن ≡ جویدن

**داخریاگ / daxiryag/:** ☚ **داخراو**

**داخریان / daxiryan/:** ☚ **داخران**

**داخز / daxiz/:** ناو. شوێنی لێژ ≡ شیب

**داخزان / dax(i)zan/:** چاوگ. داخزین؛ بە خشـکە هاتنە خوار ‹غەمزە دەستی کردە ناز و ماری زولفـی داخزی/ دڵ لە بەر پێی کەوتبوو، ئـەم دەیـدزی ئـەو دەیگەزی «حاجی قادر»› ≡ لیز خوردن

**داخزاندن / dax(i)zandin/:** چاوگ. داخلیسکاندن؛ بە خشکە هێنانە خوار ≡ لغاندن؛ سُر دادن

**داخزاو / dax(i)zaw/:** ئاوەڵـناو. بـە خشـکە بـەرەو خوار هاتوو ≡ سُرخورده

**داخزین / dax(i)zîn/:** ☚ **داخزان**

**داخستن / daxistin/:** چـاوگ. ١. خسـتنە خـوار ‹لکـەدارەکانم داخسـت› ٢. لـە دەسـت بـەردان کەوتنە سـەر زەوی ‹شـووتییەکەی داخسـت› ٣. قولف کردن؛ بەستنی دەرک بە قولـف ‹دەرک و دەروازەی داخسـت و چـوو› ٤. ڕاخسـتن؛ پـان کردنەوە لـە سـەر زەوی ‹سـفرەیان داخسـت› ٥. *[مەجاز]* هەڵکردنی ئـاگر ‹بـۆ تـەنوور و کـوورە و...› ‹تەنوورەکـە داخـە› ٦. بەسـتن؛ ڕاوەسـتاندن ‹کاتژمێر٢ فەرمانگەکەیان داخست› ٧. خێم دانانی خانوو ‹بناغەی ماڵەکەم داخست› ٨. کـۆ کـردن و دانان بۆ دواڕۆژ ‹ئازووخـەیان داخسـت› ٩. بـەرەو خوار ڕاگرتن ‹لە خەجاڵەت سـەری داخسـت؛ چـاو داخستن› ≡ ١. پایین انـداختن ٢. انـداختن ٣. قفـل کـردن ٤. گسـتردن ٥. برافـروختن کـوره و تنـور ٦. تعطیل کردن ٧. پـی ریخـتن بنـا ٨. انـدوختن؛ جمـع کردن آذوقه ٩. انداختن

**داخشان / dax(i)şan/:** چاوگ. خشان بەرەو خـوار ≡ به پایین لغزیدن

**داخشاندن / dax(i)şandin/:** چاوگ. بـەرەو خـوار خشاندن ≡ به پایین لغزاندن

**داخکوژ / daxkuj/:** ئاوەڵناو. دیقکوژ؛ زووخـاوکوژ ≡ دق‌مرگ

**داخگه / daxge/:** ناو. جێگەی داخ کـردنی مـاڵات ≡ مکان داغ‌گذاری

**داخ‌لـەدڵ / daxledił/:** ئاوەڵـناو. ١. تـــووڕە لـــە ڕووداوێ ٢. خـەمبار؛ دڵبەسـۆ ≡ ١. دلـریش ٢. اندوهگین

**داخلیسکاندن / dax(i)lîskandin/:** ☚ **داخزاندن**

**داخڵ / daxił/:** ناو. دەخیلە؛ دەغیلە ≡ قُلک

**داخڵە / daxłe/:** نـاو. قوتـووی دراوی دوکانـدار ≡ دخل مغازه‌دار

**داخم[1] / daxim/:** ☚ **داخوا[1]**

**داخم[2]:** دەنگ. داخەکەم؛ حـەیف؛ مخـابن ‹داخـم ئەوی دێر هات و ئەوی کەوناران/ هاوباوەشی مـەرگن و لە دنیا تاران «هـەژار، *چوارینـەکانی خـەییام*»› ≡ دریغا؛ افسوس

**داخما / daxma/:** ☚ **داخمه**

**داخمناچێ / daximnaçê/:** ☚ **داخەکەم**

**داخمه / daxme/:** نـاو. داخمـا؛ داغمـە؛ تەمخـە؛

ئامێری مۆری دروشم و داخ کردنی ئاژەڵ ☰ انگ داغ

**داخوا**[1] / dax(i)wa/: ئاوەڵکار. داخم؛ داخوم؛ داخۆ؛ داخۆم؛ ئاخۆ؛ ئایا؛ وشەی پرسیار ‹داخوا لە چ دایە یاری دلْدار؟/ ناوی منی جاریٚ دێتە سەر زار؟ «هەژار، مەموزین»› ☰ آیا؛ راستی

**داخوا**[2]: سارستە. بریا؛ خۆزگا؛ خۆزگە ‹داخوا بمزانیایا ئەم کارە بە کوێ دەگا› ☰ کاش؛ کاشکی

**داخواز**[1] / dax(i)waz/: ناو. ۱. ☜ **داخوازی** ۲. داوانامە؛ داخوازنامە ‹داخوازێک بنووسە بیدە بە سەرۆک!› ☰ ۱. ☜ **داخوازی** ۲. درخواست

**داخواز**[2]: ئاوەڵناو. داواکار؛ خوازەر ‹بێجیاز و مارەیی دەیدا بە شوو/ لەم هەموو کردانە داخوازی نەبوو «حاجی قادر»› ☰ خواستار

⊡ **داخواز(ی شتێ) بوون**: خوازیاری شتێ بوون ‹نزام بۆ تۆیە ڕەببەلبەیت! دلْم داخوازی ئیمدادە/ دەزانی عەبدی خۆت ئێستاکە وا بێتۆشە و زادە «ئاوات»› ☰ خواستار (چیزی) بودن

**داخوازتن** / dax(i)waztin/: ☜ **داخواستن**

**داخوازنامە** / dax(i)wazname/: ناو. داوانامە؛ لاپەڕەیەکی چاپی بە کۆمەڵە داواکارییەکی کالا یان ڕاژەوە، لە دامەزراوەیەک ☰ درخواستنامە

**داخوازی** / dax(i)wazî/: ناو. داخواز؛ داواکاری؛ کاری خواستنی شتێک ☰ درخواست

**داخواستن** / dax(i)wastin/: چاوگ. داخوازتن؛ داخازتن؛ خواستن؛ ویستن ☰ طلبیدن؛ درخواست کردن

**داخودرەوش** / dax û d(i)rewş/: ناو. کۆوکۆنجۆڵ؛ ئەشکەنجەی سەخت ‹بۆ بە بازاڕی داخودرەوش› ☰ داغ و درفش

**داخودوخان** / dax û duxan/: ناو. داخودۆخان؛ خەم و خەفەت؛ دەرد و مەینەت؛ کوڵوکەسەر ☰ غم و غصە

**داخودۆخان** / dax û doxan/: ☜ **داخودوخان**

**داخوران** / daxuran/: چاوگ. خورانەوە؛ خوریانەوە؛ وردە وردە کەم بوونەوە یان داڕزانی شتێ ‹کۆلەکەی پەردەکە لە بنی ئاوەکەدا داخورابوو› ☰ خوردە شدن؛ پدید آمدن خوردگی

**داخوراو** / daxuraw/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی دیوار، پرد یان هەر بینایەک کە خوار بووبێتەوە یان باران لایێکی شۆردبێتەوە ☰ خوردە شدە (دیوار و ...)

**داخورپان** / daxurpan/: چاوگ. داخرپان؛ داخرپیان؛ داخورپیان؛ داخورپین؛ شلەژان ☰ یکّە خوردن

**داخورپاندن** / daxurpandin/: چاوگ. شلەژاندنی مرۆ بە ترساندن یان بە خەبەری ناخۆش پێ دان ‹کە تۆ تەشریفی ناشەریف دێنی/ دلی گەلی کورد دادەخورپێنی «هێمن»› ☰ ریختن (دل)

**داخورپاو** / daxurpaw/: ئاوەڵناو. داچلەکاو؛ تووشیاری شۆک ☰ شوکّە

**داخورپیان** / daxurp(i)yan/: ☜ **داخورپان**

**داخورپین** / daxurpîn/: ☜ **داخورپان**

**داخورت** / daxurt/: ناو. کاری فاڵ گرتنەوە و ڕەمالْی ☰ پیشگویی

**داخوڕین** / daxuřîn/: چاوگ. ۱. ڕاخوڕین؛ تێخوڕین؛ داکالیان ۲. بە خۆ هەڵگوتن ☰ ۱. نهیب زدن ۲. لاف زدن

**داخوم** / daxum/: ☜ **داخوا**[1]

**داخوەستن** / dax(i)westin/: ☜ **داخۆستن**

**داخویان** / daxuyan/: ناو. ئاگادارینامە؛ ئاگادارنامە؛ نووسراوەیەک کە لە لایەن پارت، تاقم یان کۆمەڵێکەوە، لەمەڕ بابەتێکی تایبەتەوە دەردەکرێ و زۆرتر ئاگادارییەکی تێدا دراوە یان بیر و بۆچوونێکی پێ ڕوون کراوەتەوە ‹وەزارەتا دەرڤەیا ڕووسیایێ ل سەر بکار ئانینا چەکێن

کیمیەوی داخویانەک دا› ▤ بیانیه

**داخۆ / daxo/**: ئاوەلکار. داخوم؛ ئاخۆ؛ ئایا؛ وشەی پرسیار ‹داخۆ دەروونی شەق نەبووە "پەردی سەرشەقام"؟/ پیر و فوتادە تەن نەبووە "داری پیرمەسوور" ؟«نالی»› ▤ آیا

**داخۆزان / daxozan/**: ☜ **دابەزین ـ١**

**داخۆزاندن / daxozandin/**: ☜ **دابەزاندن ـ١**

**داخۆزیان / daxozyan/**: ☜ **دابەزین ـ١**

**داخۆزین / daxozîn/**: ☜ **دابەزین ـ١**

**داخۆستن / daxostin/**: چاوگ. داخوەستن؛ دابەزین؛ داوەزین؛ ئەرەوەسای ▤ پیاده شدن

**داخۆم / daxom/**: ☜ **داخوا[1]**

**ـ داخەر / -daxer/**: پاشەوشە. ژن؛ ژەن؛ پێوەدەر ‹درگاداخەر› ▤ ـ بند

**داخەکەم / daxekem/**: سارستە. داخەم ناچێ ‹داخەکەم بۆ گوڕ و تینی جوانیم/ ئەو دەمە چۆن و چ بووم، بۆ وا نیم؟! «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ▤ افسوس

**داخی / daxî/**: ناو. شار؛ گەرمی ▤ داغی

**داخیداخانم / daxîdaxanim/**: سارستە. داخداخانم؛ داخی گرانم: ١. زۆر بە داخەوە ٢. مخابن؛ حەیفی ▤ ١. با کمال تأسف ٢. ای دریغ

**داخیگرانم / daxîg(i)ranim/**: ☜ **داخیداخانم**

**داد[1] / dad/**: ناو. ١. هاوار؛ هەلا؛ هەرا ‹هەی داد هەی بێداد کوانێ یارانم؟/ کوانێ براکەی جاری جارانم؟ «فولکلۆر»› ٢. دای؛ داو: *ئەلف)* کار و ڕەوتی پاراستن و بەڕێوە بردنی ڕاستی و دروستی و دەرکردنی حوکمی ڕەوا *ب)* ماف؛ حەق ‹پەنام بە تۆ هێناوە، دادم بستێنی› ٣. داو؛ یارمەتی؛ هانا ‹گەیشتە دادم ئەگینا دەخنکام› ٤. عەدل؛ ڕاستی و دروستی ▤ ١. فریاد ٢. حق ٣. کمک ۴. عدالت

⊡ **داد پرسین**: داد گێران؛ بە شکات و مافی فەوتاوی کەسێک ڕاگەیشتن ‹ئەتۆ شا، من گەدا دادم بپرسە!/ لە زولمی چاوی بیمارت کوژاوم «نالی»› ▤ داد پرسیدن

**داد دان**: ١. ماف دان؛ حەق دان؛ نەهێشتنی ناحەقیکاری؛ دانی داد بە خاوەنی ڕاستەقینەی ٢. هاواری دادخوازی کردن ‹چە بکەم وە دەس کرانشینی؟/ داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی «شامی»› ٣. بەکەلک هاتن (زۆرتر لە ڕستەی نەرێنیدا دەگوترێ) ‹بەو هەموو دزی و فزییەوە، نوێژ و ڕۆژوو دادی نادا› ▤ ١. داد ستاندن ٢. دادخواهی کردن ٣. به کار آمدن

**داد سەندن**: وەرگرتنی حەق و ماف ▤ داد ستاندن

**داد کردن**: دادگەری کردن؛ بە گوێرەی قانوون یان ماف، کار کردن ▤ دادگری کردن

**داد گێران**: داد بەخشین؛ دادگێڕی کردن؛ مافی خەلک دابین کردن ▤ داد گُستردن

**داد[2]**: دەنگ. هەی داد؛ هەی هاوار ‹وای وە بەدبەختی، داد وە ناکامی/ دەرد دل فرەس کووتاکە شامی! «شامی»› ▤ هَوار

**دادئەستێن / dad'estên/**: ☜ **دادستان**

**دادا / dada/**: ناو. ١. وشەی ڕێز لێنان بۆ دایک، خوشک و باقی ژنان ٢. پیرەژن ٣. دایەگەورە ▤ ١. خطاب محترمانەی مادر، خواهر و دیگر خانمها ٢. پیرزن ٣. مادربزرگ

**دادان / dadan/**: چاوگ. ١. تاشین لە سەرەوە بۆ خوار ‹قەلەم دادان› ٢. سەرەتا دامەزراندن لە فێر کردندا ‹دەرس دادان› ٣. شاندان؛ پیشاندان ‹ئەمە گشت باوکی سەرمەشقی لە بۆ داداوە/ سەربەخۆ سالیکی ڕەهرەو نییە، ئوستادی هەیە «شێخ ڕەزا»› ٤. سەرەتا دامەزراندن ‹تۆ گۆڕەوییەکەم بۆ دادە تا بیچنم› ٥. دەسپێکردن ‹لە ناکاو دولبەرم فەرمووی: هەستە! ئێستەکی واعیز/ لە بۆمان دادەدا وەعزێ، گوتم: باکت چییە؟ با بێ »حاجی قادر»› ٦.

کون و کەلێن بە تۆپە قوڕ گرتن ‹دیوارەکەم داداوە› ٧. دابارین؛ دەسپێکردنی بارش ‹باران ئەبارێ نم نم دایداوە/ ئەگریجەی لە بان گۆنای قرتاوە «فولکلۆر»› ٨. دەلاندن ‹ئەم کووپە ئاو دائەدا› ٩. بەر دانەوە (پەردە) ١٠. داخستن؛ گالە دان (دەرکوبان) ١١. لە سەر زەوی نان ‹هەر دووک دەستی دادابوو؛ چۆکی داداوە› ☰ ١. تراشیدن ٢. سرمشق دادن ٣. نشان دادن ۴. رج اوّل را گذاشتن ۵. شروع کردن ۶. اندودن ٧. شروع شدن بارندگی ٨. نشت دادن ٩. انداختن (پردە) ١٠. بستن (در و پنجرە) ١١. (دست و ...) بر زمین نهادن

**دادانەوە** / dadanewe/: چاوگ. ١. بەر دانەوە (پەردە) ٢. کون و کەلێن بە قوڕ گرتن ☰ ١. انداختن (پردە) ٢. با گِل اندودن

**دادبەخش** / dadbexş/: ناوەلناو. دادپەروەر؛ دادگەر؛ خاوەن ئاکاری سازگار لەگەڵ قانووندا. هەروەها: **دادبەخشی** ☰ دادپرور

**دادبەر** / dadber/: ناوەلناو. دادخوا؛ دادخواز؛ سکالابەر؛ سکاڵەبەر؛ داوخوازکەر؛ شکایەتکەر؛ گلیکار ☰ شاکی؛ دادخواه

**دادپرس** / dadpirs/: ناو. فریاڕەس؛ کەسێ کە بە هاواری دادبەر دەگا و لە شکایەتی دەپرسێ ☰ دادرس

**دادپرسی** / dadpirsî/: ناو. ١. کار و ڕەوتی ڕاگەیشتن بە سکاڵای دادخواز و ڕوون کردنەوەی دروستی یان نادروستییان، بەتایبەت لە لایەن بەرپرسی ڕەسمییەوە (وەکوو دادوەر) ٢. یانەی دادپرسی؛ ڕێخراوەیێ کە ئەم کارەی لە ئەستۆدایە ☰ ١و٢. دادرسی

**دادپەروەر** / dadperwer/: ناوەلناو. دادگەر؛ دادگێڕ؛ دادبەخش؛ عادڵ؛ خاوەن ئاکاری سازگار لەگەڵ قانووندا ☰ دادپرور

**دادپەروەری** / dadperwerî/: ناو. دادپەروەری؛ دادگەری؛ دادیەری ☰ عدالت

**دادخوا** / dadx(i)wa/: ☜ **دادبەر**

**دادخواز** / dadx(i)waz/: ☜ **دادبەر**

**دادخوازی** / dadx(i)wazî/: ناو. دادخوایی؛ کاری هانابردن؛ ڕۆیشتن بۆ شوێنی دادپرسی بە مەبەستی گرتنی ماف ☰ دادخواهی

**دادخوایی** / dadx(i)wayî/: ☜ **دادخوازی**

**دادران** / dad(i)ran/: چاوگ. (بە سەر شتێکدا) کێشیان؛ کێشران (وەک: پەردە) ‹پەردەی کۆشکان دادراوە/ ڕۆچنەی کۆختانیش گیراوە «هێمن»› ☰ (بر سر یا روی چیزی) کشیده شدن

**دادرواو** / dadirwaw/: ☜**دادوڕاو**

**دادروون** / dad(i)rûn/: چاوگ. دادوورانـدن؛ دادوورانن؛ دادووران؛ دروونی دوو شت بە سەر یەکا ☰ بر هم دوختن

**دادڕ** / dadiř/: ☜ **دابڕ[٢]ـ١**

**دادڕان** / dad(i)řan/: چاوگ. ١. دڕان لە باری درێژییەوە لە سەرەوە بۆ خوار ٢. داکنران؛ کنیانەوە ٣. قەڵشت و درز تێکەوتن (لە زەویدا) ‹کێوەکە بە لافاو دادڕابوو› ☰ ١. پارە شدن طولی ٢. کندە شدن ٣. شیار افتادن (در زمین)

**دادڕاندن** / dad(i)řandin/: ☜ **دادڕین**

**دادڕاو** / dad(i)řaw/: ناوەلناو. دادڕیاگ؛ داتلیشاو ‹مەجنوونی لەیلی چاو غەزالێکی هاشمیم/ شاهید دەروونی چاک و یەخەی دادڕاومە «بێخود»› ☰ پارەشدە

**دادڕ ـ دادڕ** / dadiř dadiř/: ناوەلناو. ١. شڕ و وڕ؛ تەواو دڕاو ٢. لەتوپەت؛ کوت ـ کوت کراو ☰ ١. پارە ـ پارە ٢. قطعە ـ قطعە

**دادڕەس** / dadřes/: ناو. فریاڕەس؛ کەسێ کە بە شکات و سکاڵای خەڵک ڕادەگا ‹گرتوویە سەگت چاکم و لای تۆمەوە دێنێ/ یەعنی وەرە نالی کە منیش دادڕەسێکم «نالی»› ☰ دادرس

**دادڕیاگ** / dad(i)řyag/: ☞ **دادڕاو**

**دادڕین** / dad(i)řîn/: چاوگ. دڕانـدن؛ دادڕانـدن ‹کراسـەکەی دادڕی؛ کەندەکـەیان دادڕیـوە› ☰ دریدن؛ پارە کردن

**دادسان** / dadsan/: ☞ **دادستان**

**دادستان** / dads(i)tan/: ناو. دادسـێن؛ دادسـان؛ دادئەستێن؛ مافزانێ کـە لـە لایـەن دەوڵـەتەوە بەرپرسی ڕاگەیشتن بە مافی کۆمەڵگا، دروست جێبـەجێ بـوونی دەسـتوور و لـە دوو کـەوتنی سەرپێچکاران بە یارمەتی دادگایە ☰ دادستان

**دادسێن** / dadsên/: ☞ **دادسان**

**دادڤان** / dadvan/: ☞ **دادوەر**

**دادک** / dadik/: ناو. داڵک؛ دایک ☰ مادر

**دادگا** / dadga/: ناو. دادگـە؛ جێگـەی سـکالا بـۆ بردن؛ جێگایێ کە دادپرس یا دادپرسـان لەگـەڵ دادستاندا بـە سـکالای دادخـوازان ڕادەگـەن ☰ دادگاە

**دادگایی** / dadgayî/: ناو. ناچار بە ئامادە بـوون لـە دادگادا بۆ دادگایی کردن ☰ دادگاهی

**دادگە** / dadge/: ☞ **دادگا**

**دادگەر** / dadger/: ☞ **دادپەروەر**

**دادگەری** / dadgerî/: ☞ **دادپەروەری**

**دادگێڕ** / dadgêř/: ☞ **دادپەروەر**

**دادنامە** / dadname/: ناو. بـڕیارێ کـە لـە لایـەن دادگاوە دەردەچێ ☰ حکم؛ دادنامە

**دادنـووس** / dadnûs/: نـاو. سـکالانووس ☰ عریضەنویس

**دادوبسەت** / dad û b(i)set/: نـاو. دانوسـتان؛ مامەڵە؛ مامڵە؛ سەودا ☰ دادوستد

**دادوبێداد** / dad û bêdad/: ناو. هاواروهـەلا؛ هـاوار لە دەست ناحەقیکەر ☰ داد و بیداد

**دادوفوغان** / dad û fuğan/: ☞ **دادوهاوار**

**دادوەر** / dadwer/: نـاو. دادڤـان؛ داوەر؛ قـازی؛ کەسێ کە لە ناکۆکی نێوان دوو یان چەند کەسدا حوکم دەکا ☰ قاضی

**دادوهاوار** / dad û hawar/: ناو. دادوفوغان؛ هەرا و هوریا ☰ فریاد و فغان

**دادۆخـین** / dadoxîn/: نـاو. هۆجەنـەکێش؛ داروو‌کەیە سەرێکی کون کراوە دۆخینی پـێ لـە دەرپێ دەکێشن ☰ چوبکی سوراخ‌دار کە بنـد را بـا آن بە نیفە می‌کشند

**دادۆش** / dadoş/: نـاو. ۱. شـیردۆش ۲. *[مـەجاز]* کەسێ کە بە گـزی دۆسـتە و بـەهرە دەبـا ☰ ۱. شیردوش ۲. دوستِ دغل

**دادۆشین** / dadoşîn/: چاوگ. ۱. دۆشین تـا ئـاخر دڵۆپ ۲. *[مەجاز]* بەهرە بـردنی نـاڕەوای دۆسـتی گزیکار ☰ ۱. تا قطرەی آخر دوشیدن ۲. سوء استفادە کردن دوستِ دغل

**دادۆک** / dadok/: ☞ **دایەن**

**دادووران** / dadûran/: ☞ **دادڕوون**

**دادووراندن** / dadûrandin/: ☞ **دادڕوون**

**دادوورانن** / dadûranin/: ☞ **دادڕوون**

**دادووراو** / dadûraw/: ئاوەڵـناو. تەقەڵبەسـت؛ دادرواو؛ تێر تەقەڵکراو ☰ کاملاً بخیە خوردە

**دادە** / dade/: ناو. دەدە: ۱. دادی؛ دادێ؛ خوشکی گەورە ۲. دایک؛ دایە؛ داڵک ۳. دادا؛ وشەی ڕێـز لێنان بۆ دایک، خوشک و باقی ژنان ☰ ۱. آبجـی؛ خواهر بزرگتر ۲. مادر ۳. عنوان احترام‌آمیز خطـاب بـە زنان

**دادەر**[1] / dader/: ئاوەڵناو. دەڵێن ☰ تراوا

**ـ دادەر**[2]: پاشەوشـە. ۱. ـ تـراش ‹قەڵـەم‌دادەر؛ نـووک‌دادەر› ۲. فێرکـەر ‹دەرس‌دادەر› ۳. دامەزرێن ‹تۆبەدادەر› ٤. ـ دەڵـێن ‹خـوێن‌دادەر› ٥. ـ وە زەوی خەر ‹چۆک‌دادەر› ☰ ۱. ـ تراش ۲. ـ گُزار ۳. آغازگر ۴. تراوندە ۵. ـ گُذار

**دادەی** / dadey/: سارسـتە. دەی؛ ئـادەی؛ وشـەی

هاندان ☰ کلمەی تشجیع

**دادی** / dadî/: ناو. ۱. ☜ **دادە ـ۱** ۲. ☜ **دایەن**

**دادیار** / dadyar/: ناو. جێگری دادسان ☰ دادیار

**دادیک** / dadîk/: ☜ **دایك**[1]

**دادیلە** / dadîle/: ناو. وشـەی دوانـدنی خوشـکی چکۆلە ☰ کلمەی نوازش خواهر کوچکتر

**دادپەری** / dadperî/: ☜ **دادپەروەری**

**دادێ** / dadê/: ☜ **دادە ـ۱**

**دادێران** / dadêran/: چاوگ. ڕاداشتن؛ داهێشـتن؛ منداڵ بە سەر دەستەوە گـرتن بـۆ میـز کـردن ☰ روی دست گرفتن بچه برای شاشیدن

**دار**[1] / dar/: ناو. ۱. درەخت؛ درخت؛ درووشە؛ قەنا؛ ڕووەکی هەمیشەیی لە چێو بە لانی کـەم شـەش میتر بەرزی و لق‌وپۆی چەترئاسا لە سەریەوە ‹دار گوێز؛ دار بی› ۲. چێـو؛ چـۆ ‹دار، عاسـای دەسـتە «فولکلـۆر»› ۳. قەلاشـکەری؛ ئێزنـگ ٤. قـەنارە؛ سێدارە ‹لە ئولکەی عیشقەدا بێ چوونە سەر دار/ بـە ئاسانی مەزانە بوونە سـەردار «مـەحوی»› ٥. ڕبـەی خوێ پێوان ‹داریَ خـوێ بـە چەنـد؟› ٦. سـامان؛ ماڵ؛ دارایی ‹دار و نەدار› ☰ ۱. درخت ۲. چـوب ۳. هیزم ۴. دار اعدام ۵. پیمانەی نمک ۶ ثروت؛ دارایی

▣ **دار دنێ**: ☜ **داری دنیا**

**دارا ڕەش**: دارێکی لێڕەواره، زۆر ئەستوور و بڵند دەبێ ☰ از درختان جنگلی

**داری ئاوات**: *[باوەڕی کـۆن]* داری مرای؛ دارێ کـە هێندێک بە پیرۆزی دەزانن و تـەوەڕکی پێـوە دەبەستن بەشکوو ئاواتیان بەدی بێت ☰ درخت مُراد

**داری دنیا**: *[کینایـە]* دار دنێ؛ ماڵ و سـامان ☰ دار دنیا

**داری دو سـەر گـو/ گـواوێ**: *[مـەجاز]* لـە هـەردوو جێژنان بووم؛ کەسێ کە قسـە و بۆچـوونی لای هەردوو لایەنی ناکۆکییەکەوە، بێ‌نرخە ☰ چوب دو سر طلا

**داری مرای**: ☜ **داری ئاوات**

▣ **دار بـە دەم سـەگەوە دان**: *[کینایـە]* بیـانوو دانـە دەستی بێ‌حەیاوە ☰ دهان بی‌حیا را گشودن

**دار بە ڕۆحدا دان**: *[مەجاز]* وە زەلالەت هێنـان ☰ بیچارە کردن

**دار بـە سـەر بـەردا دران**: *[مـەجاز]* تێـک و مـەکان دان؛ وردوخان کردن ‹ئای کـە قـڕمان دە چەنـد شاری ناهەقان خست! داریان بـە سـەر بـەردا درا، دەوری چالاویان چۆڵ کرا، کۆشکی پتەویان چـۆڵ کرا! «هەژار، *قورئان*»› ☰ درب و داغان کردن

**دار چەقاندن**: ☜ **دار نان**

**دار دان**: لە قـەنارە دان؛ لـە سـێدارە دان ☰ دار زدن

**دار کردن**: ئێزنـگ کـۆ کردنـەوە ☰ هیـزم جمـع کردن

**دار نان**: دار چەقاندن؛ دار نیـان؛ دار ناشـتن ☰ درخت نشاندن

**دار نیان**: ☜ **دار نان**

**بردنـە داری سـەماوات**: *[کینایـە]* ئەوپـەڕی زۆر و گوشار بۆ هێنان ‹بمبەیە داری سەماواتێ نیمە!› ☰ سخت تحت فشار قرار دادن

**دار ـ**[2]: پێشوشە. دار؛ چێو ‹داربەست› ☰ دار ـ

**ـ دار**[3]: پاشەوشە. ۱. خـاوەن؛ دارنـدە؛ دارا ‹مـەڕدار؛ خێزاندار؛ شێدار› ۲. درەخت؛ بەتایبەت چێوەکەی ‹سـپیدار› ۳. بەڕێوەبـەر ‹دووکانـدار› ٤. ـ دێـر؛ پارێز؛ بەڕێوەبەر ‹ڕێدار› ☰ ۱تا۴. ـ دار

**دارئالینگ** / dar'alîng/: ناو. دارپێچ؛ لاولاو؛ لـەولاو ☰ پیچک

**دارئاڵقە** / dar'ałqe/: ناو. دوو ئالـقەی هەڵواسـراو لە یاری ژیمناستیکدا ☰ دارحلقه

**دارئەرغـو** / dar'ergû/: نـاو. داری ئەرخـەوان ☰ درخت ارغوان

**دارئەڵوەی / dar'ełwey/:** ☜ **داربەست ـ٢**

**دارا**[١] **/ dara/:** ناو. ١. جۆرێ دەرمانی چاوئێشە ٢. جۆرێ کووتاڵ ☰ ١. از داروهای چشم ٢. نوعی پارچە

**دارا**[٢]**:** ئاوەڵناو. دەوڵەمەند؛ بوودە؛ زەنگین ☰ ثروتمند

**دارابی / darabî/:** ناو. ١. سندی؛ دارێکە لە تیرەی نارنج بە میوەی مێخۆش و زەردەوە ٢. میوەی ئەو دارە ☰ ١و٢. دارابی

**دارات / darat/:** ناو. دارەت؛ کار و ڕەوتی وا نواندن؛ خۆ بە تەرزێکی تایبەت نیشان دان ‹خۆ لەو داراتە مەدە!› ☰ حالت وانمود کردن

**داراش / daraş/:** ناو. داڵ ☰ دال سیاه

**داراندنەوە / darand(i)newe/:** چاوگ. تێپەڕ. //داراندتەوە؛ دەدارێنیەوە؛ بدارێنەوە// خستن؛ ڕاڤەناندن؛ دارنایەوە ☰ انداختن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەداراندنەوە

**دارانەوە / daranewe/:** چاوگ. تێنەپەڕ. //دارایەوە؛ دەدارێیەوە؛ بدارێوە// داریانەوە؛ دارییەوە؛ دارییایۆ: ١. بە لادا هاتن؛ کەوتن بە لادا ٢. *[مەجاز]* بوورانەوە؛ دڵ لە خۆ چوون؛ لەسەرخۆ چوون ☰ ١. افتادن ٢. غش کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: داراوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەدارانەوە

**داڕای / daray/:** چاوگ. دێران؛ گونجان ☰ گُنجایش داشتن

**دارایی / darayî/:** ناو. ١. ماڵ؛ سامان ٢. کۆڵوانە لە پارچەی دارا ٣. مەزرێنگەیێ کە وەرگرتنی پیتاک و خەرکردنەوەی داهاتی دەوڵەت و دابین‌کردنی خەرجی دەوڵەتی لە ئەستۆدایە ☰ ١. دارایی ٢. چارقد ٣. ادارەی دارایی

**داربازْ**[١] **/ darbaz/:** ناو. تەنافباز؛ پەلهەوان ☰ بندباز

**داربازْ**[٢]**:** ئاوەڵناو. دارەوان ☰ ماهر در بالا رفتن از درخت

**داربازە / darbaze/:** ☜ **دارەتەرم**

**دارباسقەنە / darbasqene/:** ناو. جۆرە دارێکە دار جگەرەی لێ دروست دەکرێ ☰ چوبِ چوبسیگار

**داربڕ / darbiř/:** ناو. ١. دڕندەیەکی چکۆلەیە لە تیرەی پشیلە ٢. کەسێ کە بە بیور داران دەبڕێ ☰ ١. جانوری از تیرەی گُربەسانان ٢. هیزم‌شکن

**داربنێشت / darb(i)nêşt/:** ناو. داربەنوشت؛ دارەبەن؛ دارەوەن؛ دارقەزوان ☰ بنە

**داربۆ / darbo/:** ناو. قەرەبوو ☰ تلافی

◘ **داربۆ کردن:** *[کینایە]* تۆڵە لێ ساندنەوە و سزا دان ☰ انتقام گرفتن

**داربەدار / darbedar/:** ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. چووبەچوو؛ پاک‌لەپاک؛ تۆڵەبەتۆڵە ☰ سر به سر

**داربەڕوار / darbeřwar/:** ☜ **داربەڕوو**

**داربەڕوو / darbeřû/:** ناو. داربەڕوار؛ داری بەڕوو ☰ درخت بلوط

**داربەس / darbes/:** ☜ **داربەست**

**داربەست / darbest/:** ناو. داربەس: ١. قایمە مێو؛ داڵووت ٢. دارەتەرم؛ داربازە؛ دارئەڵوەی؛ تابووتی مردوو گواستنەوە ٣. داربەند؛ چێوبەست؛ ڕایەڵێک لە تیر (دار یا کانزا) بۆ کار کردن لە بینای بەرز ☰ ١. وادیج ٢. تابوت ٣. داربست

**داربەلەک / darbelek/:** ناو. ١. داهۆڵ؛ داوەڵ ٢. *[کینایە]* خوێڕی؛ مرۆی بێ دەسەڵات و هیچ لێ نەهاتوو ٣. *[کینایە]* تڕچماق؛ مەندەبۆر؛ مرۆی ناشیرین و ڕەزاگران ☰ ١تا٣. مترسک

**داربەند / darbend/:** ☜ **داربەست ـ٣**

**داربەندەخوێن / darbendex(i)wên/:** ☜ **داردۆخین**

**داربەنک / darben(i)k/:** ناو. دارەبەن؛ دار کەسکان ☰ درخت بَنه

**داربەنوشت / darbenuşt/:** ☜ **داربنێشت**

**داربی / darbî/**: ناو. بی؛ دارەبی ☰ بید

**داربێر / darbêr/**: ناو. داربێرە؛ داری ڕایەڵکراوی نێوان مەڕ و بزنی دۆشراو و نەدۆشراو لە کاتی مەڕ دۆشیندا ☰ چوب فاصل میان گوسفندان دوشیده و نادوشیده هنگام دوشیدن گله

**داربێرە / darbêre/**: ☜ **داربێر**

**دارپاچ / darpaç/**: ناو. تەرداس؛ تەورداس ☰ دهره

**دارپزوو / darp(i)zû/**: ناو. *[باوەڕی کۆن]* پارچە دارێکی پزوو کە وەک ملوانکە دەیکەنە ملی پەز بەشکوو نەخۆشینی پزووی چاک بێتەوە ☰ گردن‌آویز گوسفند برای بهبود مرض پزو

**دارپشکێڤ / darpişkêv/**: ناو. بای وادەی نزیک بەهار ☰ سرآغاز باد بهاری

**دارپووچ / darpûç/**: ناو. داری پیری گەندەڵ ☰ درخت پیر پوسیده

**دارپیتار / darpîtar/**: ناو. پیتار؛ پیرەدار ☰ درخت کُهنسال

**دارپیو / darpîw/**: ناو. ناوێ گشتی بۆ ئەو دارانەی چەوری گیاییان هەیە و لە پیشەسازیدا بە کار دێن ☰ درخت پیه

**دارپێچ / darpêç/**: ناو. دارئالینگ؛ لەولاو؛ گیای ملەگەوێ ☰ نیلوفر

**دارت / dart/**: ناو. کەرستەیەکی نووکتیژ و پەڕەدار کە لە یاریدا بەرەو نیشانەیەک دەیهاوێن ☰ دارت

**دارتار / dartar/**: ناو. ئاریخ؛ دارێکی درێژ لە ئەڕابەدا ☰ چوب بلند ارابه

**دارتاش / dartaş/**: ناو. مەرەنگۆز؛ نەجار؛ سنعەتکاری کەلوپەلی دارینە ☰ نجّار

**دارتاشخانە / dartaşxane/**: ناو. دووکانی نەجاری ☰ کارگاه نجّاری

**دارتاشی / dartaşî/**: ناو. مەرەنگۆزەی؛ نەجاڕی ☰ نجّاری

**دارتاوگ / dartawig/**: ناو. تایلە؛ تیرەیەک داری زەلامی ناوچەی مەدیترانە و باکووری ئێران ☰ داغداغان

**دارتورکنەک / darturk(i)nek/**: ☜ **دارتەقێنە**

**دارتورکەنک / darturken(i)k/**: ☜ **دارتەقێنە**

**دارتومەک / dartumek/**: ناو. ساز و دەوڵ؛ ساز و دنبەک پێکەوە ☰ ساز و ضرب

**دارتۆفانە / dartofane/**: ناو. دارەوەن؛ تووز؛ بەوز ☰ درخت پشّە

**دارتو / dartû/**: ناو. ١. دارەتوو؛ دارەتفێ ٢. تلپ؛ خلتەی شتی تراو ☰ ١. درخت توت ٢. دُردی

**دارتوون / dartûn/**: ناو. قرقرە؛ چرک ☰ قرقره

**دارتەپان / dartepan/**: ناو. چێوتەپانە؛ دارێکە لە کەرەستەی جۆلاییدا ☰ چوبی در دستگاه جولایی

**دارتەرم / darterm/**: ☜ **دارەتەرم**

**دارتەڤن / dartev(i)n/**: ☜ **دارتەون**

**دارتەقنە / darteqne/**: ☜ **دارتەقێنە**

**دارتەقێنە / darteqêne/**: ناو. دارتەقنە؛ دارتورکنەک؛ دارتورکەنک؛ دارکرۆکە؛ دارکوت؛ دارکوتک؛ دارکوتکە؛ دارکونکەرە؛ دارکلۆرە؛ دارکۆک؛ دارکۆ؛ دارکوە؛ دارکوکە؛ دارەکوە؛ دارەکەوە؛ دارکوتە؛ دارکۆرک؛ دارسم؛ دارەسمە؛ دارشێنە؛ تیرەیەک لە باڵندەگەلی دارژی، پەڵڕەنگین، بە دەندووکی تیژ و گورێخەوە کە بۆ دۆزینەوەی کرم و مێروو، دار دەکۆڵن، نێرەکان تاجێکی سووریان لە سەرە ☰ دارکوب

**دارتەل / dartel/**: ناو. دارتێل؛ دارەتێل؛ داری بەرز کە تەلەفوونی بە سەردا ڕایەڵ دەکەن ☰ عمود تلفن

**دارتەون / dartewn/**: ناو. دارتەڤن؛ داتەڤن؛ داروبار؛ چوارچێوەی تەونگەری ☰ چارچوبەی دستگاه قالیبافی

**دارتەی / dartey/**: چاوگ. ١. دێران؛ خونجیان؛ جێ بوونەوە ٢. ئاو داشتن ‹کاکەم لڤان ئاف دارتەی› 🇮🇷 ١. گنجایش داشتن ٢. آبیاری کردن

**دارتێل / dartêl/**: ☜ **دارتەل**

**دارجغارە / darc(i)ğare/**: ☜ **دارجگەرە**

**دارجگەرە / darc(i)gere/**: ناو. دارجغارە؛ مۆدنە؛ دەمنە؛ باسک 🇮🇷 چوب سیگار

**دارجۆخین / darcoxîn/**: ناو. داری چەقێنراو لە نێوەڕاستی خەرمان لە جێی گای بنە 🇮🇷 چوب وسط خرمن

**دارجووت / darcût/**: ناو. گاڕام؛ دارنەقیزەی گاجووت لێخوڕین 🇮🇷 سیخونک گاوآهن

**دارچک / darçik/**: ناو. داریچە؛ داریچک؛ دار بە بەرزایی یەک تا پێنج میتر بەبێ کۆتەیەکی ئەوتۆ 🇮🇷 درختچە

**دارچۆلەکە / darçoleke/**: ناو. بناو؛ بناوەچ؛ زوانە مەلیچک 🇮🇷 درخت زبان گنجشک

**دارچەسپ / darçesp/**: ناو. لەولاوی دیواری 🇮🇷 پیچک دیواری

**دارچەڵە / darçeļe/**: ناو. چەڵەک؛ قیسپ؛ ئەو دارە ئەستوورەی چیغی پێوە دەبەستن 🇮🇷 میلەی چوبی نگهدارندەی چیغ

**دارچەنگاڵ / darçengał/**: ناو. ئاڵقە و دووپشکە؛ ئامرازی نێو کەرەستەی گێرە 🇮🇷 قطعەای در خرمنکوب

**دارچین / darçîn/**: ناو. دارچینی؛ توونەدار: ١. توێکڵەدارێکی تیژ و بۆنخۆشە بە ڕەنگی قاوەیی کاڵ، بۆ تام و چێژ لە خواردنی دەکەن ٢. کوتراوی ئەو توێکڵە دارە کە بۆ تام و بۆ دانە خواردەمەنی و دەرمان بە کار دێ 🇮🇷 ١و٢. دارچین

**دارچینی[١] / darçînî/**: ناو. ١. ☜ **دارچین** ٢. ڕەنگی دارچین؛ قاوەیی کاڵی سوورکار 🇮🇷 ١. ☜ **دارچین** ٢. دارچینی

**دارچینی[٢]**: ئاوەڵناو. ١. بە ڕەنگی قاوەیی ڕۆشنی سوورکار ٢. بە تامی دارچین 🇮🇷 ١و٢. دارچینی

**دارخڕنووک / darxiřnûk/**: ناو. داربەڕوو؛ دارمازو 🇮🇷 بلوط

**داردارانێ / dardaranê/**: ناو. یارییەکی منداڵانەیە 🇮🇷 از بازی‌های کودکانە

**داردارۆک / dardarok/**: ناو. *[کنایە]* نانی زۆر کۆن و ڕەق‌هەڵاتوو 🇮🇷 نان بیات

**داردان / dardan/**: ناو. ١. هەماری ئێزنگ ٢. جێی نەمام و ڕیشەی زۆر 🇮🇷 ١. انبار هیزم ٢. نهالستان

**داردلەکانێ / dard(i)lekanê/**: ☜ **دیلەکانێ**

**داردۆخین / dardoxîn/**: ناو. داربەندەخوێن؛ دارێ کە دۆخینی تێ دەخەن و لە پزووی هەڵدەکێشن 🇮🇷 وسیلەای برای کشیدن بند تُنبان در نیفە

**داردۆژەنگ / dardojeng/**: ناو. نێرەژەن؛ داری ئەم لا و ئەو لای مەشکە کە بە زمانە دەخرێتە ناو لۆلەپەوە 🇮🇷 دو چوب کنارەی مشک

**داردوولەکان / dardûlekan/**: ☜ **دیلەکانێ**

**داردەرزی / darderzî/**: ناو. دارجەوی؛ دار بیسمیللا؛ ئاقاقیا؛ عەناوە 🇮🇷 اقاقیا

**داردەس / dardes/**: ☜ **داردەست**

**داردەست / dardest/**: ناو. داردەس؛ دارەدەست: ١. چێوێ کە بە دەستەوە دەگیردرێ ٢. *[مەجاز]* دارەدەست؛ بەکرێ‌گیراو ‹لاوی کوردم! خۆت نەکەیتە دارەدەستی دوژمنت!/ دوژمنت نەتبانە مەیدان بۆ برای خۆ کوشتنت «کاکە ئەحمەد»› 🇮🇷 ١. چوبدستی ٢. مُزدور

**داردەماخ / dardemax/**: ناو. سەوڵ 🇮🇷 سرو

**داردیلەکانێ / dardîlekanê/**: ☜ **دیلەکانێ**

**داردینك / dardîn(i)k/**: ناو. ١. داری ڕاهەنگاو بە سەر ئاخوڕدا ٢. ئاخوڕ، لە داری ناو کۆڵدراو 🇮🇷 ١. چوبی کە سر آخور گذارند ٢. آخوری کە از چوب

مى‌سازند

**داردێلەکانێ** / dardêlekanê/: ☜ **دیلەکانێ**

**دارژانوبا** / darjanuba/: ناو. فەردا؛ پنجکێکە لە گەسک دەچێ ≡ ارمک

**دارژمێر** / darj(i)mêr/: ناو. کاری ژماردنی ئاژەڵ بە داردەست ≡ سرشماری گله با چوبدستی

**دارژی** / darjî/: ناوەڵناو. [ژینەسی] بە تایبەتمەندی ژیان لە سەر دار ≡ درختزی

**دارسان** / dar(i)san/: ☜ **دارستان**

**دارستان** / daristan/: ناو. دارسان؛ لێڕ؛ لێڕەوار؛ جەنگەڵ ≡ جنگل

**دارسم** / darsim/: ☜ **دارتەقێنە**

**دارسۆرک** / darsorik/: ناو. پێوەندی هەرمێ لە داربەڕوو ≡ پیوند گلابی در درخت بلوط

**دارسوژن** / darsûjin/: ناو. یاس زەردە؛ دارێکە لە تیرەی زەیتوون، گوڵی زەرد دەکا ≡ یاس زرد

**دارسەوڵە** / darsewłe/: ناو. سەوڵ: ١. بێڵی لۆتکە ٢. دار سەوڵ ≡ ١. پاروی قایقرانی ٢. سرو

**دارسیغار** / darsîğar/: ناو. باسک؛ دەمنە؛ مۆدنە؛ دار جگەرە ≡ چوب سیگاری

**دارسیواک** / darsîwak/: ناو. ئەو داروکەی ددانی پێ دەماڵن ≡ چوب مسواک

**دارشاخ** / darşax/: ↓

⊡ **دارشاخ کردن**: ١. سووکایەتی بە سەر هێنان ٢. سەرکۆنە کردن ≡ ١. آبرو بردن ٢. سرزنش کردن

**دارشکێن** / darş(i)kên/: ناو. داربڕ ≡ هیزُم‌شکن

**دارشەق** / darşeq/: ناو. ١. چێوشەق؛ چێوشەقە؛ داری بن باڵی کەسێ کە پای شکاوە ٢. دارشەقێن؛ کاشۆ؛ گۆچانی گەمەی شەقێن ≡ ١. چوب زیربغل ٢. چوگان

**دارشەقێن** / darşeqên/: ☜ **دارشەق-٢**

**دارشین** / darşîn/: ناو. دارێکی کێوییە لە کاتی سووتاندا گڕێکی ڕۆشنی هەیە، لە جیاتی لەنتەر هەڵیان دەکرد ≡ درختی است

**دارشێنە** / darşêne/: ☜ **دارتەقێنە**

**دارغە** / darğe/: ☜ **دارۆغە**

**دارفرسەق** / darfirsaq/: ناو. داری چەقاو لە دەم ڕێگە بۆ ماوە دیاری کردن ≡ فرسنگ‌سار

**دارڤان** / darvan/: ناو. ١. داربڕ؛ کەسێ کە دار بە ئامرازی تایبەت وەک تەور و هەرە دەبڕێتەوە ٢. دارەوان؛ کەسێ یان گیاندارێ کە باش.دەتوانێ بە داراندا هەڵگەڕێ ≡ ١. کسی کە کارش قطع درخت است ٢. کسی یا جانوری که در بالا رفتن از درخت مهارت دارد

**دارڤینیسم** / darvînîsm/: ناو. ئامۆژەیەکی سەر بە چارلز دارڤین (١٨٠٩-١٨٨٢ ز.) سروشتناسی ئینگلیزی کە لە سەرهەڵدان و گۆڕانی گیانداران لە سادەوە بۆ ئاستەنگ و مانەوەی تۆرەمەی لەبارتر دامەزراوە ≡ داروینیسم

**دارقواخ** / darq(i)wax/: ☜ **دارقەواخ**

**دارقەپان** / darqepan/: ناو. دارێک کە ئاڵقەی تەرازووی گەورەی پێدا دەکەن ≡ چوب نگهدار قپان

**دارقەزوان** / darqezwan/: ☜ **دارەبەن**

**دارقەسپ** / darqesp/: ناو. ١. دار خورما ٢. دارێکە بۆ جوانی ڕایدەگرن وەک دار خورما دەچێ، بەڵام بەر نادا ≡ ١. درخت خرما ٢. نخل زینتی

**دارقەسقەوان** / darqesqewan/: ☜ **دارەبەن**

**دارقەلۆتک** / darqelotik/: ناو. لاسکی وشکی تووتن و پەمۆ ≡ شاخەی خشک پنبه و تنباکو

**دارقەواخ** / darqewax/: ناو. دارقواخ: ١. دوو لکێ کە لە زەوی دەچەقێنن و لوولە تفەنگی سەر دەخەن ٢. سێدارە؛ قەنارە ≡ ١. چوب یا فلز دوسری که هنگام تیراندازی لولەی تفنگ را بر آن تکیه می‌دهند ٢. دار اعدام

**دارقەوام / darqewam/**: ناو. ئامرازی داری خوار ڕاست کردنەوە 🇮🇷 ابزار راست کردن چوب کج

**دارک / dar(i)k/**: ناو. دەمارە تووتن 🇮🇷 رگەی برگ توتون

**دارکارچک / darkarçik/**: ناو. داری کرۆسک؛ جۆرێ هەرمێ کێوی 🇮🇷 نوعی گلابی وحشی

**دارکاری / darkarî/**: ناو. کاری بە دار لێدان. هەروەها: **دارکاری کران؛ دارکاری کردن** 🇮🇷 فلک

**دارکبژێر / dar(i)kb(i)jêr/**: ناو. ١. کاری هەڵاواردنی دەمار لە تووتن ٢. کەسێ کە دەمار لە تووتن جیا دەکاتەوە 🇮🇷 ١. جدا کردن رگەها از برگ توتون ٢. کسی کە رگەها را از برگ توتون جدا می‌کند

**دارکرۆک / dark(i)rok/**: ☜ **دارتەقێنە**

**دارکرۆکە / dark(i)roke/**: ☜ **دارتەقێنە**

**دارکلۆرە / dark(i)lore/**: ☜ **دارتەقێنە**

**دارکوت / darkut/**: ☜ **دارتەقێنە**

**دارکوتک / darkutik/**: ناو. ١. دارکۆرک؛ دارێ کە ئاگری پێ تێکوەردەدەن ٢. ☜ **دارتەقێنە** 🇮🇷 ١. چوب هم زدن آتش ٢. ☜ **دارتەقێنە**

**دارکوتکە / darkutke/**: ☜ **دارتەقێنە**

**دارکوتە / darkute/**: ☜ **دارتەقێنە**

**دارکوکە / darkuke/**: ☜ **دارتەقێنە**

**دارکونکەرە / darkunkere/**: ☜ **دارتەقێنە**

**دارکوە / dark(i)we/**: ☜ **دارتەقێنە**

**دارکۆ / darko/**: ☜ **دەرمان**

**دارکۆرک / darkorik/**: ناو. ١. ☜ **دارکوتک ـ١** ٢. ☜ **دارتەقێنە**

**دارکۆک / darkok/**: ☜ **دارتەقێنە**

**دارکۆلک / darkol(i)k/**: ناو. ١. کۆلکەداری جلیت‌بازی ٢. دەوەن و چلوو ٣. ☜ **کۆڵەوەژ** 🇮🇷 ١. تکە چوب بازیِ سوارکاران ٢. درختچەی جنگلی ٣. ☜ **کۆڵەوەژ**

**دارکەپێچان / darkepêçan/**: ناوەڵناو. *[کینایە]* لەڕ و لاواز؛ کز و کەنەفت 🇮🇷 لاغرمُردنی

**دارکەر / darker/**: ناو. ١. ئێزنگ‌کۆکەرەوە ٢. داربڕ 🇮🇷 ١. هیزم‌جمع‌کن ٢. هیزم‌شکن

**دارکەسکان / darkeskan/**: ☜ **دارەبەن**

**دارکەوکەو / darkewkew/**: ناو. کێکف؛ دارێکی لێڕەوارە کە چێوەکەی زۆر جوان و بتەوە و بۆ نازک‌کاری دەبێ 🇮🇷 کرکف

**دارکیلە / darkîle/**: ناو. داروو‌کەی لێک‌کردنی کیلەی پێوانە 🇮🇷 چوبک تنظیم ظرفیت پیمانە

**دارکێشانێ / darkêşanê/**: ناو. یارییەکە 🇮🇷 از بازی‌ها

**دارگورد / dargurd/**: ناو. داری نێوان ڕایەڵی تەون 🇮🇷 چوب میان تارهای قالی در دستگاه قالیبافی

**دارگوز / darguz/**: ناو. دارێ کە تەڵەی پێوە دەبەستن تا نێچیر نەتوانێ بیبا 🇮🇷 چوبی کە تلە را بدان بندند

**دارگوزدین / darguzdîn/**: ناو. دارێ کە لە تۆپێندا لە تۆپی دەدەن 🇮🇷 چوب چوگان

**دارگوڵە / dargułe/**: ناو. کۆڵەکەی خێوەت 🇮🇷 ستون چادر

**دارگەز / dargez/**: ناو. دارێکی تەمەن درێژە، ١٠ تا ١٥ میتر بەرز دەبێ 🇮🇷 درخت گز

**دارگەزۆ / dargezo/**: ناو. جۆرێک دار بەڕوویە، بەرێکی شیرین دەگرێ 🇮🇷 بلوط سیاه شرقی

**دارلۆق / darloq/**: ناو. گالۆک؛ گۆچان 🇮🇷 عصا

**دارلەکانێ / darlekanê/**: ☜ **دیلەکانێ**

**دارماڵ / darmał/**: ناوەڵناو. پڕاوپڕ؛ تمام‌تژە 🇮🇷 مالامال؛ لبالب

**دارمۆق / darmoq/**: ☜ **دارەتەرم**

**دارمەشکە / darmeşke/**: ناو. ناقدۆ؛ نادۆک؛ سێپای مەشکە 🇮🇷 چوب سەپایەی مشک

**دارمەڵهەم / darmełhem/**: ناو. دارمێلەو؛ دارێکە

لە هێند و ئەفغانستانەوە هاتووە، لق و پۆی درێژ، گەڵای هێلکەیی، گوڵی سپی هۆشەیی، بەری سوور و توندە و لە بیبار ئەکا 🇮🇷 برنگ کابلی

**دارمیسواک** / darmîswak/: ناو. دارێکی دایمە شینە، لە لقەکانی میسواک دروست دەکەن 🇮🇷 درخت مسواک

**دارمێشە** / darmêşe/: ناو. جۆرێکە لە دار بەڕوو 🇮🇷 نوعی درخت بلوط

**دارمێڵەو** / darmêłew/: ☜ **دارمەڵهەم**

**دارناژ** / darnaj/: ناو. سەوڵ؛ ئەسرۆ 🇮🇷 درخت سرو

**دارنایەوە** / darnayewe/: چاوگ. داراندنەوە 🇮🇷 واژگون کردن

**دارندە** / darinde/: ناوەڵناو. دارا؛ زەنگین؛ دەوڵەمەند 🇮🇷 ثروتمند

**دارنووک** / darnûk/: ناو. میداد؛ قەڵەمی دارینە 🇮🇷 مداد

**داروبار** / dar û bar/: ناو. ١. داری تەون ٢. نیر و ئامور ٣. *[کینایە]* سلامەتی؛ لەش‌ساغی 🇮🇷 ١. دار قالی ٢. خیش ٣. تندرستی

**داروبەر** / dar û ber/: ناو. *[مەجاز]* ١. جێگەی سەخت و چۆڵ ٢. هەموو شت، لە جێگایەکدا 🇮🇷 ١. زمین خشک و خالی از سکنه ٢. همه چیز

**داروبەرد** / dar û berd/: ناو. *[مەجاز]* ١. هەموو شوێنی جێگایەک ‹داروبەردیان ڕووخاندووە› ٢. بە ژمارەیەکی یەکجار زۆر ‹ئەوەندەی داروبەردی هەورامان/ ڕەحمەت بێ لە ژنی بەژنوباڵاجوان «گۆران»› 🇮🇷 ١. همە جای ٢. در شمار زیاد

**داروپەردوو** / dar û perdû/: ناو. بەرد و دار و هەڵاشی خانووە ڕووخاو 🇮🇷 آوار

**داروچکە** / daruçke/: ناو. چیلکە؛ داری چکۆلە 🇮🇷 تکه چوب

**دارودەستە** / dar û deste/: ناو. دارودەسە؛ دەس و پێوەند 🇮🇷 دارودستە

**دارودەسە** / dar û dese/: ☜ **دارودەستە**

**دارودەوەن** / dar û dewen/: ناو. لێڕەواری بە پنچک ‹پاییزە دارودەوەن ڕەنگ‌زەردە/ با تەز و سەردە، بەتۆز و گەردە «هەژار، *بۆ کوردستان*»› 🇮🇷 جنگل بوتەای

**داروديوار** / dar û dîwar/: ☜ **دەروديوار**

**دارونێڵە** / dar û nêłe/: نێر و ئامۆر 🇮🇷 خیش

**دارەوەکاز** / darewekaz/: ناو. قەیسک؛ عاسا 🇮🇷 عصا

**داروێنە** / darwêne/: ناو. نەخشێ کە لە تاشین و پێکەوە نانی لەتە دار یان کاشی بۆ جوانی بەرهەم دێت 🇮🇷 مُعرَّق

**داروێوڵ** / darwêwił/: ناو. دارچکێکی کوێستانییە 🇮🇷 درختچەای کوهستانی

**داروغە** / daroğe/: ناو. دارغە؛ قۆڵچی ناوشار؛ سەرپەرشتی پاسەوانان 🇮🇷 داروغە

**داروو** / darû/: ☜ **دەرمان ـ١**

**دارووخانە** / darûxane/: ناو. دەواخانە؛ دەرمانخانە 🇮🇷 داروخانە

**دارە** / dare/: ناو. دارێ؛ داسی دروێنە 🇮🇷 داس

**دارەبازە** / darebaze/: ☜ **دارەتەرم**

**دارەبۆق** / dareboq/: ناو. دارێکی دڕکاوییە لە شۆڕەتوو دەکا 🇮🇷 درختی خاردار

**دارەبەجینگوڵ** / darebecînguł/: ناو. داری چاکی 🇮🇷 درخت سر مزار

**دارەبەش** / darebeş/: ناو. دابەش؛ دابەشێن 🇮🇷 تقسیم

**دارەبەن** / dareben/: ناو. دارەوەن؛ دارقەزوان؛ دارقەسقەوان؛ دارکەسکان؛ داربنێشت؛ داربەنوشت 🇮🇷 بنە

**دارەبی** / darebî/: ☜ **داربی**

**دارەپێچان** / darepêçan/: ناو. دالان؛ ڕێگەی سەرداپۆشراو 🇮🇷 دالان

**دارەت** / daret/: ناو. حاڵەت؛ بار ‹خۆی لەو دارەتە نادا› ☰ وضع و حالت

**دارەتفێ** / daret(i)fê/: ناو. دارتوو؛ دارەتوو ☰ درخت توت

**دارەتو** / daretû/: ☜ **دارتو-١**

**دارەتەرم** / dareterm/: ناو. داربازە؛ دارتەرم؛ دارمۆق؛ دارەبازە؛ دارەمەیت؛ دوودارە؛ داربەس؛ داربەست؛ تابووت؛ تاوت؛ تەختی مردوو گواستنەوە ☰ تابوت

**دارەتێل** / daretêl/: ☜ **دارتەل**

**دارەدار** / daredar/: ☜ **دارە ـ دارە**

**دارە ـ دارە** / daredare/: ناو. دارەدار: ١. لارەلارە؛ دۆخی ڕێگە ڕۆیشتنی منداڵێ کە تازە پای گرتووە ‹منداڵەکەمان هەڵدەستێ بەڵام جارێ دارە ـ دارە دەکا› ٢. لەرزە ـ لەرزە؛ دۆخی ڕێگە چوونی پیری زورهان ‹دارە ـ دارەم دێ و دەسی ڕێ ئەگرم› ☰ ١. تاتی ـ تاتی ٢. لرزان ـ لرزان

**داردەست** / dardest/: ☜ **داردەست**

**دارەڕا** / dareřa/: ناو. ١. کاری داپۆشینی میچی ماڵ بە دار (کاریتە و دەستەک) ٢. جۆرێ میچی ماڵ ☰ ١. کار پوشیدن سقف خانە ٢. نوعی سقف

▣ **دارەڕا کردن:** داپۆشینی میچیماڵ ☰ پوشیدن سقف خانە

**هاتنە دارەڕا:** بەرزبوونەوەی دیوار و گەیشتنە دواڕادەی خۆی، وا کە بشێ میچی لە سەر داخەی ☰ آمادە شدن برای گذاشتن سقف

**دارەڕەت** / dareřet/: ناو. چاڵۆکەیێ کە ڕاوکەر دەیکۆڵێ تا نێچیری تێکەوێ ‹دەری دێوجامە و ناوی دارەڕەت «مەسەل»› ☰ چالەی دام

**دارەڕەش** / dareřeş/: ناو. ناروەن؛ جۆرێ داری بێبەر و شەنگە ☰ درخت نارون

**دارەست** / darest/: ناو. بەرگر؛ لەمپەر ☰ مانع

**دارەسمە** / dares(i)me/: ☜ **دارتەقێتە**

**دارەشکێنە** / dareş(i)kêne/: ناو. دەرمانێکە بۆ برین ☰ نوعی مرهم

**دارەغاڵ** / dareğal/: ناوەڵناو. دارەغان؛ تەرە؛ بازەڵە؛ لە لان تۆراو ☰ از لانە بُریدە

**دارەغان** / dareğan/: ☜ **دارەغاڵ**

**دارەکوە** / darek(i)we/: ☜ **دارتەقێتە**

**دارەکەوە** / darekewe/: ☜ **دارتەقێتە**

**دارەڵۆسک** / darełosk/: ناو. کاری دەست پێوە گرتن بۆ هەستان ‹بە دار و دیوارەوە دارەڵۆسک دەبێ› ☰ کار چنگ انداختن برای برخاستن

**دارەمەیت** / daremeyt/: ☜ **دارەتەرم**

**دارەوان**[1] / darewan/: ناو. ١. دارڤان؛ کەسێ باش بە داردا هەڵدەچێ ٢. باڵندەیەکە دەوری ١٢ سانتیمیتر دەبێ، پشتی قاوەیی و بەرزگی سپییەکی تۆخە، بە قنەقن بە داراندا هەڵدەچێ و لە کۆنە داران هێلانە ساز دەکا ☰ ١. کسی کە در بالا رفتن از درخت ماهر است ٢. دارخزک

**دارەوان**[2]: ناوەڵناو. بە توانستی هەڵگەڕان بە داراندا ‹سمۆرەی دارەوان› ☰ ماهر در بالا رفتن از درخت

**دارەوەن** / darewen/: ناو. ١. ☜ **دارتۆفانە** ٢. ☜ **دارەبەن**

**دارهەڵوک** / darhelûk/: ناو. دارە درێژەکەی گەمەی هەڵووکێن ☰ چوب بلند بازی الک‌دولک

**دارهەنگڵ** / darhengił/: ناو. چێوشەقە؛ چێوشەق؛ دارشەق؛ داری بن هەنگڵی لاقشکاو ☰ عصا

**دارهەنە** / darhene/: ناو. ١. دار تەون ٢. کەوانی هەلاجی ☰ ١. دار قالی ٢. کمان حلاجی

**داری** / darî/: ناو. جۆرێک بەڕ ☰ نوعی گلیم

**داریانەوە** / daryanewe/: چاوگ. ١. هەڵداریان ٢. بەم لا و بەو لادا کەوتن ٣. *[مەجاز]* بوورانەوە؛ دل لە خۆ چوون ☰ ١. چپە شدن ٢. تلو ـ تلو خوردن ٣. از حال رفتن

**دارِیای** / daryay/: ☜ **دێران**

**داریایۆ** / daryayo/: ☜ **دارانەوە**

**داریایەوە** / daryayewe/: ☜ **دارانەوە**

**داریچک** / darîçik/: ☜ **دارچك**

**داریچە** / darîçe/: ☜ **دارچك**

**داریل** / darîl/: ناو. بەرمیل؛ کووپەی دارینی سەرگیراو ⊑ چلیک

**داریلانک** / darîlan(i)k/: ناو. گولێکی بۆنخۆشە ⊑ گلی خوشبو

**دارین** / darîn/: ناو،ئاو. دارینە؛ چێوی؛ چێوین؛ چووینە؛ تایبەتمەندی هەر شتێ کە لە دار دروست بووبێ ⊑ چوبین

**دارینە** / darîne/: ☜ **دارین**

**دارێ** / darê/: ناو. دارە؛ داسی دروێنە ⊑ داس

**دارێنە** / darêne/: ناو. سەلە؛ نانەشان ⊑ آبکش چوبین

**دارِزان** / dař(i)zan/: چاوگ. دارِزیان؛ دارِزین: ۱. داتولان ۲. تەواو رزین ۳. [مەجاز] زۆر تەریق بوونەوە ‹ئەرێ دانارِزێی وا ئەکەی!› ⊑ ۱. بسیار پخته شدن ۲. پوسیدن ۳. شرمسار شدن

**دارِزاندن** / dař(i)zandin/: چاوگ. دارِزانن؛ دافەتاندن: ۱. تولاندنەوە ۲. رزانن ⊑ ۱. بسیار پُختن ۲. پوساندن

**دارِزانن** / dař(i)zanin/: ☜ **دارِزاندن**

**دارِزاو** / dař(i)zaw/: ناو،ئاو. دارِزیو؛ دارِزیاو؛ دارِزیاگ؛ دارِزای: ۱. کۆنی لەبەریەک چوو ۲. داتولاو؛ زۆر کولاو ۳. [مەجاز] شەرمەزار؛ خەجالەتبار. هەروەها: **دارزاوی** ⊑ ۱. فرسوده ۲. بسیار پخته ۳. شرمنده

**دارِزای** / dař(i)zay/: ☜ **دارِزاو**

**دارِزیاگ** / dařizyag/: ☜ **دارِزاو**

**دارِزیان** / dařizyan/: ☜ **دارِزان**

**دارِزیاو** / dařizyaw/: ☜ **دارِزاو**

**دارِزین** / dař(i)zîn/: ☜ **دارِزان**

**دارِزیو** / dař(i)zîw/: ☜ **دارِزاو**

**دارِژان** / dař(i)jan/: چاوگ. دارِژیان؛ دارِژین؛ دارِێژران؛ دارِێژان: ۱. لە سەرەوە بۆ خوار رِژان ۲. دە ناو قالب چوون ⊑ ۱. پایین ریخته شدن ۲. در قالب ریخته شدن

**دارِژاندن** / dař(i)jandin/: چاوگ. دارِژتن؛ دارِیتن؛ دارِێتن؛ دارِێژاندن: ۱. سەرەوخوار رِشتن ۲. دە قالب کردن ⊑ ۱. پایین ریختن ۲. در قالب ریختن

**دارِژاو** / dař(i)jaw/: ناو،ئاو. ۱. لە سەرەوە بۆ خوار رِژاو ‹لەنگێزەیی بەهارە کە هەلساوە خالە! یا/ فرمێسکی چاوی سووری بەخورِ دارِژاومە «بێخود»› ۲. دە قالب کراو ‹قابلەمەی دارِژاو› ⊑ ۱. پایین ریخته شده ۲. قالب‌ریزی‌شده

**دارِژتن** / dařijtin/: ☜ **دارِژاندن**

**دارِژیان** / dařijyan/: ☜ **دارِژان**

**دارِژین** / dař(i)jîn/: ☜ **دارِژان**

**. دارِژێن** / dař(i)jên-/: پاشەوشە. ـدابارێن؛ ـ داوەرێن ⊑ ـ فروریز

**دارِسان** / dař(i)san/: چاوگ. دارِسکان؛ دارِسیان؛ هەلمەت بردن؛ پەلامار دان ⊑ یورش بردن

**دارِسکان** / dařiskan/: ☜ **دارِسان**

**دارِسکاندن** / dařiskandin/: چاوگ. گرتن و بە زۆر رِاکێشان ⊑ گرفتن و به زور کشیدن

**دارِسیان** / dařisyan/: ☜ **دارِسان**

**دارِشتن** / dařiştin/: چاوگ. ۱. دارِژاندن ‹(سەروەرم! دەریاچەی ئەو خەونە هیچ گەرانەستێرەی جێنەهێشت؟/ قەتارەی ئەو هەوری وشانە نەخرۆشان؟/ گزنگیان دانەرِشت؟ «شێرکۆ»› ۲. کل دە چاو کێشان ۳. چنین؛ لە پەنا یەک خونجاندن ٤. دابین کردن یان پێکهێنانی گەلالە ⊑ ۱. ریختن ۲. سُرمه کشیدن ۳. کنار هم چیدن ۴. طراحی کردن

**دارِشتە**[1] / dařişte/: ناو. ۱. بیچم؛ کەسم؛ تەحر ۲.

گەلاڵە؛ نەخشە؛ تەرح ☰ ١. ریخت ٢. طرح

**دارشته**[٢]: ئاوەڵناو. ١. ڕێژراو؛ کڵ کێشراو ٢. چنراو ٣. دەقالب کراو ٤. گەلاڵە ڕێژراو ☰ ١. سُرمه کشیده ٢. چیده شده ٣. قالب شده ۴. طراحی شده

**دارِمان** / dař(i)man/: چاوگ. دارِمیان؛ دارِمین؛ دارِووخان؛ دارِووخیان؛ ڕووخانی سەربەرەوژێر ‹باڵەخانەیەکی بازرگانی لە تاران دارِما› ☰ فروریختن

**دارِماندن** / dař(i)mandin/: چاوگ. دارِمانن؛ دارِووخاندن؛ ڕووخاندن لە سەر بۆ خوار ☰ فروریختن

**دارِمانن** / dař(i)manin/: ☜ **دارِماندن**

**دارِماو** / dař(i)maw/: ئاوەڵناو. دارِووخاو؛ دارِووخیاگ؛ دارِووخیاو؛ ڕووخاو لە سەر بۆ خوار ‹پلاسکۆ: باڵەخانەیەکی دارِماو› ☰ فروریخته

**دارِمیان** / dařimyan/: ☜ **دارِمان**

**دارِمین** / dař(i)mîn/: ☜ **دارِمان**

**دارِنان** / dař(i)nan/: چاوگ. دارِووتان؛ بە دەست ڕووتەوە کردن ☰ تراشیدن

**دارِنران** / dařinran/: چاوگ. ١. دارِووتان؛ ڕووتەوە بوون ٢. تراشیان؛ تاشیان ☰ ١. کنده شدن ٢. تراشیده شدن

**دارِنین** / dař(i)nîn/: چاوگ. ١. دارِووتاندن؛ دارِووتانن؛ ڕووتەوە کردن لە شتێ ‹ئەو کەسەی نەیبینی هاتی دوژمنی/ نیری یەخسیریی لە ئەستۆ دارِنی «هێمن»› ٢. تاشین و داماڵین ‹شێریکی مردووی ڕۆژێ لە دەشت دی/ بە هەر نۆعێ بوو پێستی دارِنی «کەمالی»› ☰ ١. لُخت کردن ٢. کندن؛ تراشیدن

**دارِۆچکان** / dařoçkan/: چاوگ. داهێلان ☰ فروهشتن

**دارِۆچکاندن** / dařoçkandin/: چاوگ. داهێشتن ☰ فروهشتن

**دارِۆچکاو** / dařoçkaw/: ☜ **دارِۆچکە**

**دارِۆچکە** / dařoçke/: ئاوەڵناو. دارِۆچکاو؛ داهێڵراو ☰ فروهشته

**دارِوو** / dařû/: ناو. واجبی؛ دەرمان حەمام ☰ واجبی

⊡ **دارِوو گرتن**: دەرمان حەمام لە خۆ دان ☰ واجبی گرفتن

**دارِووتان** / dařûtan/: ☜ **دارِنان**

**دارِووتاندن** / dařûtandin/: ☜ **دارِنین ـ١**

**دارِووتانن** / dařûtanin/: ☜ **دارِنین ـ١**

**دارِووجان** / dařûcan/: ناو. دەنکێکی ڕەشە لە ناو برنجدا ☰ کدرم

**دارِووچان** / dařûçan/: چاوگ. ئاوەڕووت بوون ☰ آبروت شدن

**دارِووچاندن** / dařûçandin/: چاوگ. ئاوەڕووت کردن ☰ آبروت کردن

**دارِووچای** / dařûçay/: ئاوەڵناو. ئاوەڕووتکراو ☰ آبروت

**دارِووخان** / dařûxan/: ☜ **دارِمان**

**دارِووخاندن** / dařûxandin/: ☜ **دارِماندن**

**دارِووخانە** / dařûxane/: ناو. شوێنێ لە حەمام کە دەرمانی موودامالی لێ دەگرن ☰ جای واجبی گرفتن در گرمابه

**دارِووخاو** / dařûxaw/: ☜ **دارِماو**

**دارِووخیاگ** / dařûxyag/: ☜ **دارِماو**

**دارِووخیان** / dařûxyan/: ☜ **دارِمان**

**دارِووخیاو** / dařûxyaw/: ☜ **دارِماو**

**دارِووش** / dařûş/: ناو. ڕووکە؛ ڕووش ☰ خراش

**دارِووشان** / dařûşan/: چاوگ. لە سەرەوە بۆ خوار ڕووکان ☰ خراشیدن

**دارِووشاندن** / dařûşandin/: چاوگ. لە سەرەوە بۆ خوار ڕووکاندن ☰ خراشیدن

**دارِەت** / dařet/: ئاوەڵناو. بەردەس؛ نزیک بۆ دەست تێ گرتن ☰ در دسترس

**داڕیتن / dařîtin/:** ☜ **داڕژاندن**

**داڕێتن / dařêtin/:** ☜ **داڕژاندن**

**ـ داڕێژ / dařêj-/:** پاشەوشە. ـــ ڕێــژ؛ ـ پێــژ ‹گەلالەداڕێژ› ☱ ـ ریز؛ ـ چین

**داڕێژان / dařêjan/:** ☜ **داڕژان**

**داڕێژاندن / dařêjandin/:** ☜ **داڕژاندن**

**داڕێژران / dařêjran/:** ☜ **داڕژان**

**داڕێژکار / dařêjkar/:** ناو. کەسێ کە کار و پیشەی داڕشتن و دە قالب کردنی کانزای تواوەیە ☱ ریختەگر

**داڕێژگە / dařêjge/:** ناو. ١. قالبی شت تێدا تواندنەوەی پیشەسازان ٢. کارگەیەک کە ئەم کارەی تێدا دەکرێ ☱ ١. قالب ریختەگری ٢. کارگاه ریختەگری

**داڕێژەر / dařêjer/:** ناو. ئارەمەت ☱ ریختەگر

**داڕێژی / dařêjî/:** ناو. ١. پیشەی داڕێژکار ٢. کار و ڕەوتی داڕشتن؛ دە ناو قالب کردنی کانزای تواوە ☱ ١و٢. ریختەگری

**دازان / dazan/:** ☜ **داهێزان**

**دازایین / dazayîn/:** چاوگ. دادان؛ دەلیان ☱ تراویدن

**داژ / daj/:** ☜ **داش**

**داژدار[١] / dajdar/:** ناو. داشدار؛ قەلاچی؛ پاسەوانی کەلهە ‹وەختی ئیمەی کورد ڕزگارمان بوود/ ئیلام، کرماشان داژدارمان بوود «فولکلۆر»› ☱ نگهبان قلعه

**داژدار[٢]:** ئاوەڵناو. داشدار: ١. [کینایە] لاگر؛ لایەنگر ‹بێ‌وچان هەولی ئەدا سەرۆک عەشیرەتەکان بکاتە داژداری حکومەت› ٢. خاوەن؛ مالک ‹ئێمە داژداری ئەم دەشتەین› ☱ ١. طرفدار ٢. صاحب؛ مالک

**داژداری / dajdarî/:** ناو. لایەنگری؛ لاگری ☱ هواخواهی؛ طرفداری

**داژگیر / dajgîr/:** ناو. داشگیر؛ بێژنگی کون هەڵە بۆ گەنم پاک کردن ☱ الک گندم پاک کردن

**داژوێنەر / daj(i)wêner/:** ناو. شۆفێر؛ ئاژۆ؛ هاژۆ؛ ئاژوەر ☱ راننده

**داژەن / dajen/:** ناو. خەسوو؛ دایکی ژن ☱ مادرزن

**داژەندن / dajendin/:** چاوگ. داژەنن؛ داژەنین؛ بەرەو خوار کردن ‹لووتی داژەند ئەسپەکەم خۆم دەستەئەژنۆ ماتی غەم/ من لە فیکری حالی ئەو، ئەو شینی حالی من دەکا «سالم»› ☱ پایین گرفتن

**داژەنن / dajenin/:** چاوگ. ١. ☜ **داژەندن** ٢. هەڵواسین ☱ ١. ☜ **داژەندن** ٢. آویزان کردن

**داژەنین / dajenîn/:** چاوگ. ١. ☜ **داژەندن** ٢. لە بەر یەک هەڵوەشاندنی کەل‌وپەل (وەک: سەعات و چەک و ...) ☱ ١. ☜ **داژەندن** ٢. دِموناژ کردن

**داژی / dajî/:** ئاوەڵکار. لارە سێبەری عەسر ☱ قبل از غروب

**داژیار / dajyar/:** ناو. بژیو؛ ڕزق؛ ڕۆزی ☱ روزی؛ قوت

**داس / das/:** ناو. ١. داڕێ؛ کەرەسەی دروێنە و کۆکەن ‹داس لە سەپان مەشارەوە «فولکلۆر»› ٢. کەرەنتو؛ جۆرێ داسی دەم پان و دەستە بلیند ☱ ١. داس ٢. نوعی داس بُلند

**داساکانن / dasakanin/:** ☜ **داکاساندن**

**داساکین / dasakîn/:** ☜ **داسەکنان**

**داسانە / dasane/:** ناو. چیرۆک؛ داستان؛ ڕاز ☱ داستان

**داسپاردن / das(i)pardin/:** چاوگ. ڕاسپاردن؛ قەوینتی کردن ☱ سفارش کردن

**داسپاردە / das(i)parde/:** ئاوەڵناو. ١. ڕاسپێراو ٢. [پەلار] داسەپاو؛ دانراو لە لایەن کەسێکی‌ترەوە و گوێڕایەڵی وی بوون ‹دەوڵەتی داسپاردە› ☱ ١. سفارشی ٢. دست‌نشانده

**داس‌پەڕێن / daspeřên/:** ناو. کاری بە داس پەڕاندنی وێنجەی ساوا بۆ قایم‌تر بوونی

پنجەکەی ☰ هرس یونجەی ضعیف برای تقویت آن

**داستان / dastan/:** ناو. ١. چیرۆک ٢. نەزیلە؛ کورتەچیرۆک ٣. دیرۆک؛ چیرۆکی خەیالی ‹ئەمە داستان نییە، ڕاستە› ٤. باسی سەرەکی ڕووداو، فیلم، شانۆ یان کتێبێک ‹داستانی فیلمەکە زۆر دڵتەزێنە› ٥. ریو؛ گزی ‹ئانە شیرینەن دلبەر دلستان/ دل چێت مەسانۆ بە مەکر و داستان «سەیدی»› ☰ ١تا٤. داستان ٥. فریب؛ حیله

**داسخاڵە / dasxałe/:** ناو. داسی گوشاد کە تایبەتی گیا دروونە ☰ داس گشاد ویژەی درو گیاه

**داسراکیان / das(i)rakyan/:** چاوگ. ئارام گرتن ‹ڕۆلە دا تاوێ داسراکێ!› ☰ آرام گرفتن

**داسراکێن / das(i)rakên/:** ئاوەڵناو. دامرکێن؛ ئارامکەرەوە ☰ آرامبخش

**داسرەفتن / das(i)reftin/:** ☜ **داسرەوتن**

**داسرەکان / das(i)rekan/:** ☜ **داسرەوتن**

**داسرەواندن / das(i)rewandin/:** چاوگ. داسەکناندن؛ داکاسانن ☰ آرام کردن

**داسرەوتن / das(i)rewtin/:** چاوگ. داسرەفتن؛ داسرەوین؛ داسرەکان؛ داسەکنان؛ داسەکنین؛ هەدا دان؛ ئارام گرتن ☰ آرام گرفتن

**داسرەوین / das(i)rewîn/:** ☜ **داسرەوتن**

**داسرین / das(i)řîn/:** چاوگ. سرین ☰ ستردن

**داسقاڵە / dasqałe/:** ناو. داسوولکە ☰ داس کوچک

**داسک / dask/:** ناو. ١. داسی چکۆلە ٢. تەورداس ٣. هەودای دەزوو ☰ ١. داس کوچک ٢. داس شاخەبُری ٣. تار نخ

**داسکەرەنتو / daskerentû/:** ناو. ترپان؛ مەڵەغان؛ کەرەمتوو؛ داسی درێژی دسکدار کە بە پێوە پێی دەدروون ☰ داس بُلند دستەدار کە با آن ایستادە درو می‌کنند

**داسکێش / daskêş/:** ناو. دروێنەوان ☰ دروگر

**داسگ / dasg/:** ☜ **داسو**

**داسماڵ / dasmał/:** ناو. داسماڵە؛ کۆکەن؛ دروێنەی گیا بە داس ☰ درو گیاه با داس

**داسماڵە / dasmałe/:** ☜ **داسماڵ**

**داسمڕان / das(i)mřan/:** چاوگ. داکوتران؛ پڕ و پتەو بوونەوە بە هۆی داکوتران ☰ محکم استوار شدن

**داسمڕاو / das(i)mřaw/:** ئاوەڵناو. داکوتیاگ؛ قەڵەوی کورتەباڵای توند و تۆڵ ☰ کوتاه‌قد بانُبیه

**داسن / das(i)n/:** ناو. خوازبێنی‌کەر ☰ خواستگار

**داسنی[1] / dasnî/:** ناو. ناوی تیرەیەکی کوردە ☰ تیره‌ای از کردها

**داسنی[2]:** ئاوەڵناو. دیسنی؛ سەر بە ئایینی زەردەشتی ☰ زرتشتی

**داسو / dasû/:** ناو. داسگ؛ داسووک؛ داسووکە؛ داسوولکە؛ داسە؛ بژانگ؛ پرزەی گوڵی گەنم و جۆ ☰ اخگل؛ داسه

**داسوک / dasûk/:** ☜ **داسو**

**داسوکە / dasûke/:** ☜ **داسو**

**داسولکە / dasûlke/:** ناو. ١. ☜ **داسو** ٢. داسی پچووک ☰ ١. ☜ **داسو** ٢. داس کوچک

**داسە / dase/:** ☜ **داسو**

**داسەپان / dasepan/:** چاوگ. داسەپێنران؛ بە زۆر دانران ☰ تحمیل شدن

**داسەپاندن / dasepandin/:** چاوگ. بە زۆر دانان ‹خۆی داسەپاند› ☰ تحمیل کردن

**داسەپاو / dasepaw/:** ☜ **داسپاردە ـ٢**

**داسەپێنران / dasepênran/:** ☜ **داسەپان**

**داسەکاندن / dasekandin/:** هێورکردنەوە؛ کوڵ‌وکۆ دامراندن ☰ آرام کردن

**داسەکنان / daseknan/:** چاوگ. داسەکنین؛ داساکین؛ هێور بوونەوە ☰ آرام شدن

**داسەکناندن / daseknandin/:** چاوگ. هێور

کردنەوە ☰ آرام کردن

**داسەکناو / daseknaw/**: ئاوەڵناو. سەرەوتوو؛ داکەسیای؛ ئۆقرەگرتوو ☰ آرام‌گرفته

**داسەکنین / daseknîn/**: ☜ داسەکنان

**داسەکیان / dasekyan/**: چاوگ. هەدان؛ داکاسیان ☰ آرام گرفتن

**داسیلە / dasîle/**: ناو. داسی پچووک ☰ داس کوچک

**داش / daş/**: ناو. داژ: ١. کوورەی ئاسنگەر و پیشەکاران ٢. میچی سەر تەنوور ٣. پیادەی شەترەنج و دامە ☰ ١. کوره ٢. سقف بالای تنور ٣. پیادەی شطرنج و دامه

**داشاخە / daşaxe/**: ناو. ئاشاخە؛ ئەیاغی میوە و ... ☰ بُنجُل

**داشاردن / daşardin/**: چاوگ. شاردنەوە؛ حەشار دان ☰ پنهان کردن

**داشاریاگ / daşaryag/**: ئاوەڵناو. داشاریگ؛ شاراوە؛ شاردراوە ☰ پنهان شده

**داشاریان / daşaryan/**: بوونە ژێرەوە؛ کەوتنە ژێر شتێکەوە ☰ زیر شدن

**داشاریگ / daêarîg/**: ☜ داشاریاگ

**داشبۆرد / daşbord/**: ناو. پەڕەی خوار شووشەی پێشەوەی ماشێنی هۆدەدار کە چرا و کلیل و پێژمێرەکانی موتوری تێدایە ☰ داشبورد

**داش‌بەداش / daşbedaş/**: ناو. ١. وشەیەکە لە گەمەی دامە ٢. *[کینایە]* تۆڵە ☰ ١. اصطلاحی در بازی دامه ٢. انتقام

**داشت / daşt/**: ناو. داشتە؛ داشتی؛ داشە؛ ئاژەڵی ڕاگیراو بۆ بەر و بوو ☰ دام نگهداری شده برای تولیدمثل

**داشتن / daştin/**: چاوگ. ١. ئاو لێنان؛ ئاویاری کردن؛ ئاودێری کردن ‹خەلە داشتن› ٢. لە سەر بۆ خوار شوشتن ٣. خاوەن بوون ‹یەی فەرشی داشتم مینستە جل شاڵ/ باب پالان بی ئەڕای یابوو ئاڵ «شامی»› ☰ ١. آبیاری کردن ٢. شُستن از بالا به پایین ٣. داشتن

**داشتە[1] / daşte/**: ☜ داشت

**داشتە[2]**: ئاوەڵناو. کۆنە ☰ کُهنه

**داشتی / daştî/**: ☜ داشت

**داشدار / daşdar/**: ☜ داژدار

**داشداری / daşdarî/**: ناو. ١. لایەنگری ٢. ئاگاداری؛ پارێزگاری ☰ ١. طرفداری ٢. حفاظت؛ نگهداری

**داشدیار / daşd(i)yar/**: ناو. بناوان؛ گەورەی ماڵ ☰ مُدیر خانه

**داشدیاری / daşd(i)yarî/**: ناو. سەرپەرشتی؛ ‹شادم بە ئەو زەمانە کە بە داشدیاری ڕەنجبەران/ وەرزێر ئەنێتە گەردنی ئاغا گوریسی سوور «قانع»› ☰ سرپرستی

**داشقە[1] / daşqe/**: ناو. عارەبانە؛ گاری ☰ گاری

**داشقە[2]**: ئاوەڵناو. *[بەلار]* کۆن؛ لەکارتە ‹ماشینی داشقە› ☰ فرسوده

**داشک / daşk/**: ناو. جاش؛ بەچکەی کەر ☰ کرەخر

**داشکان / daş(i)kan/**: چاوگ. داشکیان: ١. لە بایەخ کەم بوونەوە ‹نرخی زێڕ داشکا› ٢. لە قەرەبووی شتێکا چوون ٣. کەم بوونەوە؛ دابەزین؛ هاتنە خوارەوە ‹بە هۆی شەڕەوە ژمارەی دانیشتوانی داشکا بۆ ١٥٠٠ کەس› ٤. *[مەجاز]* ڕەتیان؛ زۆر ماندوو بوون ☰ ١. کاستن؛ کسر شدن ٢. تلافی شدن ٣. کاهش یافتن ۴. بسیار خسته شدن

**داشکاندن / daş(i)kandin/**: چاوگ. داشکانن: ١. لە حەساو کەم کردنەوە ‹قەرزەکەی پاریش داشکێنە!› ٢. کەم کردنەوە لە بایی شتێ یان تاوانی کەسێک ‹گرانە، تۆزێکی داشکێنە!› ٣. هەڵبڕانی جۆگە بۆ ئاودێری ٤. قەرەبوو کردنەوە ٥. *[مەجاز]* ڕەتاندن؛ زۆر ماندوو کردن ٦. خوار

کردنەوە ٧. داگیران ‹مەرەکان داشکینە بۆ داوینی کەژەکە!› ٨. ژاکان؛ تێکچوونی لەش‌ساخی بە هۆی نەخۆشی، پەک‌کەوتن یان پەژارەوە ‹پوورم تەواو داشکاوە› ☰ ١. از صورت حساب کسر کردن ٢. تخفیف دادن ٣. شکستن جوی در کار آبیاری ۴. تلافی کردن ۵. بسیار خسته کردن ۶. خم کردن ٧. پایین بردن گله ٨. شکسته شدن

**داشکانن** / daş(i)kanin/: ☜ **داشکاندن**

**داشکەلەرم** / daşkelerm/: ناو. داشەکەلەم؛ کەلەمی بێ‌گەڵای ڕەق کە وەک توور دەخورێ ☰ کلم قُمری

**داشکەلەم** / daşkelem/: ☜ **داش‌کەلەرم**

**داشکیان** / daşikyan/: ☜ **داشکان**

**داشگیر** / daşgîr/: ☜ **داژگیر**

**داشلانە** / daşlane/: ناو. شاگردی کلیسا لە گوندەکانی کوردستان ☰ نام اختصاصی شاگردان کلیسا در کردستان

**داشلیقاندن** / daş(i)lîqandin/: چاوگ. فلیقاندنەوە ☰ له کردن

**داشلیقیان** / daş(i)lîqyan/: چاوگ. فلیقانەوە؛ پلیخانەوە ☰ له شدن

**داشوشتن** / daşuştin/: چاوگ. [مەجاز] تێشکان؛ لێکەوتن؛ لێکەفتن؛ مایەپووچ بوون؛ نابووت بوون ☰ ورشکست شدن

**داشۆ** / daşo/: ناو. ١. کاکە؛ براگەورە ٢. داشێ؛ ئابرا؛ وشەی دواندنی براگەورە ☰ ١. برادر بزرگ ٢. داداش

**داشۆران** / daşoran/: چاوگ. داشۆریان؛ داشۆرین؛ شۆریانەوە بە ئاو یان تراوێک لە سەر بۆ خوار ☰ از بالا به پایین شسته شدن

**داشۆراندن** / daşorandin/: چاوگ. شوشتن لە سەرەوە بۆ خوار ☰ از بالا به پایین شستن

**داشۆراو** / daşoraw/: ئاوەڵناو. داشۆریاگ؛ بە ئاو یان تراوێک لە سەر تا خوار شۆراو ☰ از بالا به پایین شسته شده

**داشۆردن** / daşordin/: چاوگ. ١. شۆردنەوە بە ئاو یان تراوێک لە سەر بۆ خوار ٢. [کینایە] شۆردنەوە؛ ئابڕوو بردن ‹جوان-جوان دامشۆرد با جارێکی‌تر قسە بۆ کەس هەڵنەبەستێ› ☰ ١. شُستن از بالا به پایین ٢. آبرو بردن

◘ **دەس/ دەست لە شتێ داشۆردن**: [کینایە] ئومێد پێ نەمان؛ هیوا لێ بڕان ☰ از چیزی قطع امید کردن

**داشۆریاگ** / daşoryag/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **داشۆراو** ٢. [کینایە] داماڵیاگ؛ بێ‌شەرم و ئابڕوو ☰ ١. ☜ **داشۆراو** ٢. بی‌شرم و حیا

**داشۆریان** / daşoryan/: ☜ **داشۆران**

**داشۆرین** / daşorîn/: ☜ **داشۆران**

**داشۆڕان** / daşořan/: چاوگ. داشۆڕین؛ بەرەوژێر شۆڕ بوونەوە ☰ آویزان شدن

**داشۆڕاندن** / daşořandin/: چاوگ. داهێڵان؛ شۆڕەوە کردن ☰ آویزان کردن

**داشۆڕاو** / daşořaw/: ئاوەڵناو. داشۆڕیاگ؛ داهێزاو ☰ شُل‌وول

**داشۆڕیاگ** / daşořyag/: چاوگ. داهێڵراو؛ داهێژراو لە سەرەوە بۆ خوار ☰ آویزان‌شده

**داشۆڕین** / daşořîn/: ☜ **داشۆڕان**

**داشە** / daşe/: ☜ **داشت**

**داشەکان** / daşekan/: چاوگ. خوار بوونەوە بەم لا و بەو لادا ☰ آویزان شدن و به هر طرف تکان خوردن

**داشەکاندن** / daşekandin/: چاوگ. خوار کردنەوە بەم لا و بەو لادا ☰ آویزان کردن و به هر طرف تکان دادن

**داشەکەلەم** / daêekelem/: ☜ **داش‌کەلەرم**

**داشەهارە** / daşehare/: ناو. دوامین پیادەی گەمەی دامە ☰ آخرین مُهره در بازی دامه

**داشی / daşî/**: ناو. ویشیچن؛ گولچن؛ هەژاری لەتەچن لە پەرێز ☰ خوشەچین

**داشیار / daşyar/**: ناو. کەیوانووی ماڵ ☰ کدبانو

**داشێ / daşê/**: ناو. داشۆ؛ ئابرا؛ وشەی ڕێز بۆ دواندنی برای گەورە ☰ داداش

**داشێلان / daşêlan/**: چاوگ. ١. لە سەرەوە بۆ خوار بە نهێم دەس گوشار دان ٢. کردنە ژێرەوە ☰ ١. فروفشردن ٢. زیر گرفتن

**داعبا / da'ba/**: ☜ دەعبا

**داعووران / da'ûran/**: چاوگ. قووت دان ☰ قورت دادن

**داغ / dağ/**: ☜ داخ

▣ **داغی شتێ کەسێ کوشتن**: شتێ، ڕووداوێ بۆ کەسێ زۆر ناڵەبار و ناخۆش بوون ‹دەچێ بۆ لای ڕەقیب، خۆشە، وەلێ ئەو داغە کوشتوومی/ لە کن ئەو چەندە مەجبوورە، لە لای من چەندە مەغرووە! «نالی»› ☰ از حسرت چیزی سوختن

**داغان / dağan/**: ئاوەڵناو. ١. بە دۆخ و حاڵەتێکی ناڵەبار و ناکۆکەوە ٢. بەرباد؛ تەفر و توونا؛ تەرت و توونا ☰ ١و٢. داغان

**داغدار / dağdar/**: ☜ داخدار

**داغدیە / dağd(i)ye/**: ☜ داخدیە

**داغکراو / dağk(i)raw/**: ئاوەڵناو. قرچاو ☰ گُداخته

**داغمە / dağme/**: ☜ داخمە

**داغە / dağe/**: ناو. ناوی هەڵپەڕکێیەکی کوردی ☰ از رقص‌های کردی

**داف / daf/**: ناو. ١. تەڵە؛ داو ٢. گیرۆیی؛ گرفتاری؛ دۆخی گران و ئازاردەر ☰ ١. دام ٢. گرفتاری

**دافرتان / dafirtan/**: چاوگ. لێدەرپەڕین ☰ بیرون جهیدن

**دافرتانن / dafirtanin/**: چاوگ. ١. لە ناوەوە دەراویشتن ٢. داجرتاندن؛ بە زۆر و لە سەر ناچاری پارە دان ☰ ١. بە بیرون ورجهاندن ٢. سلفیدن

**دافرەقان / daf(i)reqan/**: ☜ داپلۆخان ـ١

**دافرەقانن / daf(i)reqanin/**: ☜ داپلۆخاندن ـ١

**دافرەقیان / daf(i)reqyan/**: ☜ داپلۆخان ـ١

**دافرەقین / daf(i)reqîn/**: ☜ داپلۆخان ـ١

**دافسین / daf(i)sîn/**: چاوگ. فس خواردن؛ قزە بوون؛ دانیشتنی مریشک بۆ کەڵەشێر ☰ نشستن مرغ زیر خروس

**دافلیقان / daf(i)lîqan/**: چاوگ. پلیشانەوە ☰ لە شدن

**دافلیقاندن / daf(i)lîqandin/**: چاوگ. پلیشاندنەوە ☰ لە کردن

**دافەتان / dafetan/**: ☜ داپلۆخان ـ١

**دافەتاندن / dafetandin/**: ☜ داڕزاندن

**دافەتاو / dafetaw/**: ☜ داپلۆخاو

**دافەتین / dafetîn/**: ☜ داپلۆخان ـ١

**داڤ / dav/**: ناو. داو ☰ دام

**داڤبسک / davbisk/**: ناو. داوموسک؛ داوی تەپکە ☰ دام از رشتەی مو

**داڤدۆز / davdoz/**: ئاوەڵناو. ١. /کینایە/ فێڵباز و زرنگ ٢. لە داو ترساو (زۆرتر بۆ کەوێ کە تخوونی داو ناکەوێ) ☰ ١. زیرک و مکار ٢. از دام رمیده

**داڤزەه / davzeh/**: ☜ دەلاڤ ـ٣

**داڤسک / davsik/**: ناو. داموسک؛ مووی کلکی یەکسم ☰ موی دُم ستور

**داڤک / davik/**: ناو. داوی ڕاوەکەو ☰ دامی کە برای کبک گذارند

**داڤەڕستن / daveřistin/**: چاوگ. ١. پێکەوە نووسان (وەک دەنکە ترێ بە تەنیشت یەکەوە) ٢. ڕاسان؛ دەست هەژاندن و هەڕەشە کردن ☰ ١. بە هم چسبیدن ٢. تهدید کردن با دست

**داڤەگر / davegir/**: ئاوەڵناو. بەتاسە؛ بەئاوات ☰ آرزومند

**داڤی / davî/:** ئاوەڵناو. دوایی؛ دوماهی؛ ئاخری ☰ آخری

**داقرتاندن / daqirtandin/:** چاوگ. ١. کرۆژتن؛ کرۆتان ٢. بە ددان شکاندن و بڕین ☰ ١. خاییدن ٢. با دندان شکستن و بریدن

**داقرچان / daqirçan/:** چاوگ. داقرچیان: ١. ترنجان ٢. لە جێوە سووتان و داوەرین ‹بە هەر بۆمبای سووتێنەرێک، پێشمەرگەیەک/ داری چاکێک دائەقرچێ «سوارە»› ☰ ١. ترنجیدن ٢. در جای خود سوختن و ریختن

**داقرچاندن / daqirçandin/:** چاوگ. هەڵقرچاندن؛ گرنج کردن ☰ ترنجاندن

**داقرچیان / daqirç(i)yan/:** ☜ **داقرچان**

**داقلیشان / daq(i)łîşan/:** چاوگ. داقەڵشان؛ داقەڵەشان؛ لە سەر بۆ خوار درز بردن ☰ شکافته شدن از بالا به پایین

**داقلیشاندن / daq(i)łîşandin/:** چاوگ. داقەڵشاندن؛ داقەڵەشاندن؛ داقەڵەشتن؛ داقەڵەشین؛ دادڕین؛ ڕاقولپاندن؛ لە سەر بۆ خوار لەت کردن ☰ شکافتن از بالا به پایین

**داقلیشاو / daq(i)łîşaw/:** چاوگ. داقلیشیاگ؛ داقەڵەشاو؛ داقەڵەشیاو؛ لە سەر بۆ خوار درزبردوو ☰ شکافته از بالا به پایین

**داقلیشیاگ / daq(i)łîşyag/:** ☜ **داقلیشاو**

**داقنان / daq(i)nan/:** چاوگ. داقنین؛ پلۆخان ☰ له شدن

**داقناو / daq(i)naw/:** ئاوەڵناو. داقنیو؛ پلۆخاو ☰ لەشده

**داقنین / daq(i)nîn/:** ☜ **داقنان**

**داقنیو / daq(i)nîw/:** ☜ **داقناو**

**داقوپاو / daqupaw/:** ئاوەڵناو. ناڤچاڵ؛ کووڕ؛ هەڵگەڕاو وەک ناوی کاسە ☰ مُقعر

**داقوتان / daqutan/:** ☜ **داکوتان**

**داقوتاندن / daqutandin/:** ☜ **داکوتان**

**داقوتیان / daqutyan/:** ☜ **داکوتران**

**داقورتان / daqurtan/:** چاوگ. قووت دان ☰ بلعیدن

**داقورتاندن / daqurtandin/:** چاوگ. قورتاندن؛ قووت دان ☰ قورت داذن

**داقورچاندن / daqurçandin/:** چاوگ. قورچاندن؛ قویت دان ☰ قورت دادن

**داقوساندن / daqusandin/:** چاوگ. قەیچی کردن ☰ قیچی کردن

**داقولین / daqulîn/:** چاوگ. شکیان ☰ شکستن

**داقەلاشتن / daqełaştin/:** چاوگ. ١. لە سەر بۆ خوار لەت کردن (دار و چێو) ٢. *[کینایە]* هەڵاتنی بە پەلە ☰ ١. فروشکافتن ٢. با شتاب گریختن

**داقەڵشان / daqełşan/:** ☜ **داقلیشان**

**داقەڵشاندن / daqełşandin/:** ☜ **داقلیشاندن**

**داقەڵەشان / daqełeşan/:** ☜ **داقلیشان**

**داقەڵەشاندن / daqełeşandin/:** ☜ **داقلیشاندن**

**داقەڵەشاو / daqełeşaw/:** ☜ **داقلیشاو**

**داقەڵەشتن / daqełeştin/:** ☜ **داقلیشاندن**

**داقەڵەشیاو / daqełeşyaw/:** ☜ **داقلیشاو**

**داقەڵەشین / daqełeşîn/:** ☜ **داقلیشاندن**

**داک / dak/:** ناو. دایک؛ دێ؛ دیا ☰ مادر

**داکاسان / dakasan/:** چاوگ. داکاسیان؛ داکاسین؛ ئۆقرە گرتن؛ داسەکنان؛ هەدادان ☰ آرام گرفتن

**داکاساندن / dakasandin/:** چاوگ. داساکانن؛ داسەکناندن؛ داکەساندن؛ داسرەواندن ☰ آرام کردن

**داکاسانن / dakasanin/:** ☜ **داکاساندن**

**داکاسیان / dakasyan/:** ☜ **داکاسان**

**داکاسین / dakasîn/:** ☜ **داکاسان**

**داکاڵیان / dakałyan/:** چاوگ. خورین؛ داخوڕین ☰ نهیب زدن

**داکتن / dakitin/**: چاوگ. شۆڕەوە بوون؛ داهـێلان 🇮🇷 آویخته شدن

**داکران / dak(i)ran/**: چاوگ. ۱. داڕێژران ۲. خاڵی کرانەوە ۳. چەقێنران 🇮🇷 ۱. ریخته شـدن ۲. تخلیـه شدن ۳. فرو شدن

**داکردن / dakirdin/**: چـاوگ. داکرن: ۱. تێکـردن؛ کردنە ناو دەفرەوە ‹چایەک داکـە› ۲. کردنـە نـاو چاڵ ‹گەنمەکەم داکرد› ۳. دادان؛ داباریـنی بـاران ‹لە ناکاو باران دایکـرد› ٤. ئـاژەڵ کردنـە ژوورەوە ‹حەیوانـەکانم داکـرد› ٥. چەقانـدن؛ دانـانی وا نـەبزوێ (وەک: نیشـانە، گـوێچ و ... لـە کایـەدا) ‹هەڵماتەکەت داکـە› ٦. قەڵشـاندنی دیـوار و ... ‹دز هـاتوون و بـە دیواربڕ لایـەک لـە دیوارەکـەیان داکردووە› ۷. خاڵی کردن ‹بارەکەی هێنا، لە کـوێ دایکـا؟› 🇮🇷 ۱. کشـیدن/ ریخـتن (غـذا) ۲. در چالـه ریختن ۳. آغاز شـدن بـارش ۴. دام را در آغـل جـای دادن ۵. قرار دادن تیله یا نشانه برای نشـانەگیـری ۶. شکافتن دیوار و ... ۷. خالی کردن

**داکرمان / dakirman/**: چاوگ. داکرمین؛ کوتیان و ورد بوون بە ددان 🇮🇷 خاییده شدن

**داکرمانـدن / dakirmandin/**: چـاوگ. داکرۆشـتن؛ داکـرۆژتن؛ بـە ددان ورد کـردنی شـتی ڕەق 🇮🇷 خاییدن

**داکرمین / dakirmîn/**: ☜ **داکرمان**

**داکرن / dak(i)rin/**: ☜ **داکردن**

**داکروپـان / dak(i)rupan/**: چـاوگ. چاوپۆشـی لێکردن 🇮🇷 چشم‌پوشی کردن

**داکرۆژتن / dak(i)rojtin/**: ☜ **داکرماندن**

**داکرۆشتن / dak(i)roştin/**: ☜ **داکرماندن**

**داکشان / dak(i)şan/**: چاوگ. ۱. بەرەو ژێر خشین ۲. کشـانەوە؛ پاشـگەز بوونـەوە ‹کەسـێک نییـە هەڵکشانی بیابان و داکشانـی زۆزانەکان سۆسە بکـات «پەشێو»› 🇮🇷 ۱. پایین خزیدن ۲. عقب‌نشینی کردن

**داکشاندن / dak(i)şandin/**: چـاوگ. ۱. بەرەو ژێـر ڕەتاندن ۲. پاشەکشـە پـێ کـردن 🇮🇷 ۱. بـه زیـر کشیدن ۲. عقب راندن

**داکشاوی / dak(i)şawî/**: ناو. ژێـری درێـژ لـە بـن پیت 🇮🇷 حرکت زیر کشیده در هجی کردن

**داکشه / dak(i)şe/**: ناو. ۱. کاری بە خشکە بـەرەو خـوار چـوون ۲. نیشـتاو؛ دیـاردەی چوونـە خـوارەوەی ئـاوی دەریاکـان بـە هـۆی هێـزی ڕاکێشەری خۆر یان مانگەوە. بەرانبـەر: **هەڵکشە** 🇮🇷 ۱. عمل پایین خزیدن ۲. جزر آب

**داکنران / dakinran/**: ☜ **داڕان ـ۲**

**داکوتـان / dakutan/**: چـاوگ. داکوتاندن؛ داقوتـان؛ داقوتاندن: ۱. بە نهێم بە زەویـدا دان ‹مەزرەقـەم داکوتا› ۲. سەرێک لە زەوی یا دیـوار و... بردنـە خوار ‹ئەو سنگەم داکوتا› ۳. داتەقانن؛ تەقانن؛ لـە بێژنگ دانی دەغڵ ٤. هەڵواسین و توند کردن بە بزمار ‹وێنەیەکی هەورامانم لە ژوورەکەم داکوتـا› ٥. *[کینایە]* بە میـوانی لـە جێگایـەک زۆر مانـەوە ٦. قورس بـە زەویـدا ڕۆچـوون و خـۆ گـرتن ‹بـاش ڕیشەی داکوتاوە› ۷. سـەلماندن (قسـە) ‹ئـاخری قسەی خۆی داکوتا!› 🇮🇷 ۱. محکم بر زمـین زدن ۲. فروکوبیدن ۳. بیختن ۴. نصب کـردن ۵. جـا خـوش کردن ۶. ریشه دواندن ۷. به کُرسی نشاندن (سخن)

**داکوتـاندن / dakutandin/**: ☜ **داکوتان**

**داکـوتران / dakutran/**: چـاوگ. داکوتیـان؛ داقوتیان: ۱. بە نهێم بە زەویدا دران ۲. تـەقیان؛ داتەقیان؛ لە بێژنگ درانی دەغڵ ۳. هەڵواسران و تونـد کـران بـە بزمـار ‹وێنەیـەکی هـەورامان لـە ژوورەکەی داکوتراوە› ٤. ڕۆچوون بە دیوار و زەوی و ...دا 🇮🇷 ۱. محکم بر زمین خوردن ۲. بیخته شـدن ۳. نصب شدن ۴. فرو شدن

**داکوتیاگ / dakutyag/**: ☜ **داسمڕاو**

**داکوتیان / dakutyan/**: ☜ **داکوتران**

**داکودەوا** / dak û dewa/: ☜ **داودەرمان ـ١**

**داکوژان** / dakujan/: چاوگ. داکوژیان: ١. برانەوەی شەڕ و کێشە ٢. کوژرانەوەی ئاگر ☱ ١. پایان یافتن جنگ و نزاع ٢. خاموش شدن آتش

**داکوژاندن** / dakujandin/: چاوگ. داکوژانن: ١. دوایی پێهێنانی چنراو ٢. برینەوەی شەڕ و کێشە ٣. کوژاندنەوەی ئاگر ☱ ١. خاتمە دادن بافت؛ کور کردن بافته ٢. پایان دادن به جنگ و نزاع ٣. خاموش کردن آتش

**داکوژانن** / dakujanin/: ☜ **داکوژاندن**

**داکوژیان** / dakujyan/: ☜ **داکوژان**

**داکۆ**[1] / dako/: ناو. دایک؛ داک ☱ مادر

**داکۆ**[2]: ئامراز. بۆیە؛ لە بەر ئەمە ☱ زیرا

**داکۆکە** / dakoke/: ناو. هەرا و هوریای ئاپۆرەی مەردم ☱ جنجال؛ شلوغی

**داکۆکی** / dakokî/: ناو. ١. پشتیوانی؛ لاگیری ‹داکۆکی لە مافی ڕەوای کورد› ٢. کۆشش؛ تەقالا ٣. پێداگری؛ پێکۆڵی؛ کاری پێ بە گەز دان ❋ هەروەها: **داکۆکی کردن** ☱ ١. پشتیبانی ٢. کوشش ٣. پافشاری

**داکە** / dake/: ☜ **دایك**[1]

**داکەتن** / daketin/: چاوگ. ١. کەوتنە خوار ٢. پەڕینی نێر لە مێ (بۆ ئاژەڵ) ٣. خوار بوونەوە؛ لار بوونەوە ☱ ١. فروافتادن ٢. جفتگیری کردن نر و مادە ٣. کج شدن

**داکەتێ** / daketê/: ئامراز. هەتاکوو؛ هەتا؛ تا ‹مِن هامە ئێرە، داکەتێ ئێوە تێنەو› ☱ تا؛ تا اینکە

**داکەسان** / dakesan/: ☜ **داکەسیان**

**داکەساندن** / dakesandin/: ☜ **داکاساندن**

**داکەسیان** / dakesyan/: چاوگ. داکەسان؛ داکەسین؛ داسەکنین؛ هەدا دان ☱ آرام گرفتن

**داکەسیای** / dakesyay/: ☜ **داسەکناو**

**داکەسین** / dakesîn/: ☜ **داکەسیان**

**داکەفتگ** / dakeftig/: ☜ **داکەوتوو**

**داکەفتگی** / dakeft(i)gî/: ناو. ١. قوپاوی زەوی یان بان ٢. گیرۆدەیی؛ دۆخی لە کار و جووڵانەوە کەوتن ☱ ١. گودشدگی زمین یا بام ٢. زمینگیری

**داکەفتن** / dakeftin/: ☜ **داکەوتن**

**داکەفتی** / dakeftî/: ناو. مۆد؛ سەلیقەی کۆمەڵگا ☱ مُد

**داکەلاندن** / dakelandin/: ☜ **داکەندن**

**داکەناندن** / dakenandin/: ☜ **داکەندن**

**داکەندن** / dakendin/: چاوگ. داکەلاندن؛ داکەناندن؛ داکەنن؛ داکەنین؛ ژخۆ کردنی جلک؛ (بەرگ) لە بەر دەرهێنان ‹شەو شەوکراسی خومی خۆی داکەند/ ئاسۆ بە شەفەق کەوتە شەکەرخەند «پیرەمێرد»› ☱ درآوردن لباس

**داکەنران** / dakenran/: چاوگ. داکەنیان؛ داماڵان؛ کەنیان ☱ پایین کشیده شدن

**داکەنن** / dakenin/: ☜ **داکەندن**

**داکەنیان** / dakenyan/: ☜ **داکەنران**

**داکەنین** / dakenîn/: ☜ **داکەندن**

**داکەواندن** / dakewandin/: چاوگ. خستنە خوارەوە ☱ پایین انداختن

**داکەوتن** / dakewtin/: چاوگ. داکەفتن؛ کەوتەرەی؛ کەوتەیرە: ١. کەوتنە خوار ‹لە دەستم داکەوت› ٢. لە سەرەوە بۆ خوار هاتن ‹چارەسەری سروشتی بۆ ئەوانەی چاویان داکەوتووە› ٣. داهاتن؛ بوونە داب و باو ‹ئەم شێوە ژیانە لە ڕۆژاواییانەوە داکەوتووە› ٤. داسرەوتن؛ ئۆقرە گرتن ‹بەو دەمەت کە بۆنی سەد بەهاری لێوە دێ/ پێم مەڵێ کە داکەوم «سوارە»› ٥. چوونە لاوە ‹شەرمێونی داکەوت بە بادە/ بەر بوونە گیانی یەک دوو سادە «هەژار، *مەموزین*»› ٦. داهاتن؛ قوپانی زەمین یان بان ٧. بڵاو بوونەوە ‹دەنگۆ داکەوتن› ٨. بڵاوە کردنی نەخۆشی ‹وریای خۆت بە! پەتایەکی پیس

داکـەوتووە› ٩. داتـەپین؛ داتـەمران؛ داکراسـیان؛ داسەپان ‹داکـەوە بۆخـۆت لـە کونجـێ چیتـە لـەم هات‌وچووە «قانع»› ١٠. لاکەفتـە بـوون؛ گونوولـە بوون؛ بە هۆی نەخۆشـی یـان پیریـیـەوە، هێـز و توانی هەستان و ڕێگەچون پێ نەمان ☚ ١. پـایین افتادن ٢. پایین آمدن ٣. مُد شـدن ۴. آرام گـرفتن ۵. کنار رفتن ۶. فرورفتن بام یا زمین ۷. شـایع شـدن ۸. شایع شدن بیماری ۹. تمرگیدن ۱۰. زمینگیر شـدن از بیماری یا پیری

**داکەوتوو / dakewtû/**: ئاوەڵناو. داکەوتە؛ داکەفتگ: ١. وە خوار کەوتوو ٢. لە کار کـەوتوو ٣. بـڵاوەوە بوو ☚ ١. افتاده ٢. زمینگیر ٣. شایع شده

**داکەوتە / dakewte/**: ☜ **داکەوتوو**

**داکێشان / dakêşan/**: چـاوگ. ١. لە سەرەوە بەرەو خـوار کێشـان ٢. ڕاخسـتن؛ داخسـتن ٣. درێـژ کردنەوە ‹ڕەحمەتت لـێ‌بـێ پـات داکێشـە!› ☚ ١. فروکشیدن ٢. گُستردن ٣. دراز کردن

**داگ / dag/**: ناو. ناو؛ نێوان ☚ میان

**داگا / daga/**: نـاو. نـەنک؛ داکـی داک و بـاب ☚ مادربزرگ

**داگر[1] / dagir/**: ئاوەڵـناو. داگـیر: ١. داگیرکـەر؛ دەست‌بەسەرداگر ٢. هەموو لا وەبەر خـۆ دەر ☚ ١. غاصب ٢. فراگیر

**▪ داگر[2]**: پاشەوشە. ١. ـ چەقێن ‹پێ‌داگر› ٢. ـ دابەزێن ‹بارداگر› ٣. ـ وەشێر ‹خۆداگر› ٤. ـ داپۆش ‹بە تەم، بە مژ، بە هورە، بە دۆک/ بە تۆفانی وڵات‌داگر «هێمن»› ☚ ١. ـ گیر ٢. پیاده‌کننده ٣. پنهان کن ۴. ـ پوشان

**داگرتن / dagirtin/**: چـاوگ. داگـردن: ١. هێنانـە خوار لە سەرەوە ‹هەر گەیشـتمە لایـان، هـەموویان کلاویـان داگـرت و سـڵاوێکی گـەرمیان لـێ کـردم «هەژار، چێشتی مجێـور»› ٢. گرتنە بـەر خـۆ؛ بـە هەموو لا ڕاگەیشتن ‹تەمی غەم تا قیامـەت بـۆچی دانەگرێ وڵاتی کورد/ کە زاتێکی وەفادار و نـەجیب و خانەدان ڕۆیی «بێخود»› ٣. پـڕ کـردنی شـتێ ٤. دادروونی پەراوێزی جل بە سەر یەکا ٥. لێـدانی بێ‌پسانەوە ‹وای بە داریان داگرت گوتمان دەمـرێ› ٦. بێ وچان ڕووی قسە لە کەسێ کردن و هـەدا نەدان ‹وا بە قسە دایگرتم هۆشـم نـەما› ٧. ئامـادە کردنی بار ‹لە بەیانییەوە دوو بار ئالفمان داگرتـووە› ٨. دابەزاندنی بـار ‹ئـەو بـارە لـە سـەر قـاترەڕەش داگرن!› ٩. دانلۆد کـردن ‹داگرتنـی ئـەپ› ١٠. مەلاس دان؛ خۆ حەشار دان ‹باوکە پیرەکەت وا لە گەوڕ گا/ خۆی داگرتووە بۆ جیرەی درگا «فولکلۆر»› ☚ ١. برداشتن ٢. فراگـرفتن ٣. پـر کـردن ۴. بـرهم دوختن حاشیەی لبـاس ۵. زدن متـوالی ۶. پُرچـانگی کردن ۷. آماده کردن بار ۸. پایین آوردن بار ۹. دانلـود کردن ۱۰. فالگوش ایستادن

**داگرتنەوە / dagirt(i)newe/**: چـاوگ. ١. دووبـارە پـڕ کـردن ٢. بـە سـەر یـەکا دروونی پـەراوێزی جل‌وبەرگ ٣. کوتانەوە؛ پەستاوتن؛ ئاخنینەوە ☚ ١. دوباره پر کردن ٢. برهم دوختن کنارەی لبـاس ٣. کوبیدن و انباشتن

**داگرتوو / dagirtû/**: ☜ **داگرتی ـ١**

**داگرتی / dagirtî/**: ئاوەڵـناو. ١. پـڕ؛ داگرتـوو ٢. *[کینایە]* بـادی‌هـەوا؛ بـەفیز؛ لووتبـەرز ☚ ١. پُـر ٢. مُتکبر

**داگردن / dagirdin/**: ☜ **داگرتن**

**داگرسان / dagirsan/**: چـاوگ. تێنەپەڕ. //داگرسـای؛ دادەگرسـێی؛ داگرسـێ// داگرسـیان؛ داگیرسـان؛ داگیریان: ١. هەڵبوون؛ پێ‌بوونی ئاگر ٢. *[مەجاز]* هەڵبوون؛ ڕۆشن بـوون؛ کەوتنـە کـاری ئـامێری کارەبـایی و ... ٣. *[کینایـە]* تـووڕە بـوون ‹وەهـا داگیرسابوو کەس نەیدەوێرا قسەی لەگەڵ بکا› ☚ ١. برافروختن ٢. روشن شدن ٣. بسیار عصبانی شدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: داگرسـاو/ چـاوگی نـەرێنی: دانەگرسان

**داگرســـاندن / dagirsandin**/: چـــاوگ. تێپـــەڕ. //داتگرساند؛ دادەگرسێنی؛ داگرسێنە// **داگریساندن**؛ داگیراندن؛ داگیرانن؛ داگیرساندن؛ داگیرسانن: ١. پـێ کـردن؛ هەڵـکردنی ئـاگر ٢. *[مەجاز]* هەڵکردن؛ ڕۆشن کردن؛ خستنە کاری ئامێری کارەبایی و ... ٣. *[کینایە]* بوونە هۆی سەرهەڵدانی کێشەیەک ‹شەڕەکەی داگیرساند بۆ خـۆی دەربـاز بوو› ☰ ١. مُشتعل نمودن ٢. روشـن کـردن ٣. فتنـه برانگیختن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: ـــ/ چـاوگی نـەرێنی: دانەگرساندن

**داگرســـاو / dagirsaw**/: ئاوەڵـــناو. داگیرســــاو؛ داگرسیاگ؛ هەڵبوو؛ ئاگرتێبەربوو ☰ مُشتعل

**داگرسیاگ / dagirsyag**/: ☜ **داگرساو**

**داگرسیان / dagirs(i)yan**/: ☜ **داگرسان**

**داگریساندن / dag(i)rîsandin**/: ☜ **داگرساندن**

**داگـڕان / dag(i)řan**/: چاوگ. وە خـوروو هـاتنی هەموو لەش ☰ به خارش افتادن بدن

**داگڕانـدن / dag(i)řandin**/: چـاوگ. وە خـــوروو هێنانی لەش لە نەخۆشی ☰ بـه خـارش انـداختن بدن از بیماری

**داگژانـدن / dag(i)jandin**/: چـاوگ. گووشـــین ☰ فشار دادن

**داگژگـژین / dagijg(i)jîn**/: چـاوگ. کوشــــین دە مستێدا ☰ افشُردن

**داگوشین / daguşîn**/: چاوگ. وشـین لـە سـەرەوە بەرەو خوار ☰ فشردن از بالا به پایین

**داگەڕان / dageřan**/: چاوگ. داگێـڕان: ١. بـەرەو خوار هاتن لە لای سەرەوە ‹شل شل داگـەڕان بـۆ دەم ڕووبـاری/ تـا پـێش تاریکـان بچنـەوە شـاری «هێمن»› ٢. گۆڕان؛ بارودۆخێکی تر گرتنـە خـۆ ‹ڕەش داگەڕان؛ گەرم داگـەڕان› ☰ ١. فرود آمدن ٢. به حالت دیگر افتادن

**داگەڕاو / dageřaw**/: ئاوەڵـناو. هەڵـگەڕاو؛ پـڕ لـە دومەڵ و زیپکە ☰ پر از دمُل و جوش

**داگەڕیـان / dageřyan**/: چـاوگ. ١. ســەنگین و گران بوونی لەش ٢. کەڵ گرتنی ئاژەڵـی بـەرزە ‹مانگاکەمان داگەڕیاگە› ☰ ١. کِرخ شـدن ٢. بـاردار شدن

**داگیر / dagîr**/: ئاوەڵناو. ↓

⊡ **داگیر کردن**: ١. لەهاندن؛ زەوت کردن؛ بـە زۆر ساندن؛ دەست بە سەردا گرتن ٢. بە هەموو لا ڕاگەیشتن ☰ ١. غصب کردن ٢. فراگرفتن

**داگیران / dagîran**/: چاوگ. ١. داگیریان؛ بە هۆی هۆکارێکەوە، باری ئاسایی ئاڵۆز بوون: *ئا)* گـەرم و گران بوونی لەش لە تا *ب)* گران بوونی گـوێ *پ)* ســوور هەڵـگەڕانی چـاو لـە چاوئێشــە ٢. گـڕ تێچوون؛ هەڵبوون ٣. هێنرانـە خـوارەوە ‹بارەکـە داگیرا› ٤. داپۆشـران ‹مانـگ داگـیرا› ٥. بـە زۆر ســەندران ‹وە پـاش کـەوت خـەباتمان/ داگـیراوە ولاتمان «هێمن»› ☰ ١. به علتی حالت عادی خود را از دست دادن *الف)* گرم و سنگین شدن جسم از تـب *ب)* سنگین شدن گوش *پ)* سُرخ شدن چشم بـر اثـر چشم‌درد ٢. برافروختن؛ شعله‌ور شدن ٣. تخلیه شـدن ۴. پوشیده شدن ۵. غصب شدن

**داگیراندن / dagîrandin**/: ☜ **داگرساندن**

**داگیرانن / dagîranin**/: ☜ **داگرساندن**

**داگیـــراو / dagîraw**/: ئاوەڵـــناو. ١. داگیریــــاگ؛ لەش‌داهاتوو لە بەر تا ٢. گڕتێچوو ٣. بۆ خوارەوە هێنراو ٤. ئامادە و تەیار ‹خەرمانی داگـیراو؛ بـاری داگیراو› ☰ ١. گرم و سنگین شده از تب ٢. مُشـتعل؛ آتش‌گرفته ٣. پایین آورده شده ۴. مُهیا

**داگیرسان / dagîrsan**/: ☜ **داگرسان**

**داگیرساندن / dagîrsandin**/: ☜ **داگرساندن**

**داگیرسانن / dagîrsanin**/: ☜ **داگرساندن**

**داگیرساو / dagîrsaw**/: ☜ **داگرساو**

**داگیرکار / dagîrkar/**: ناو. *[رامیاری]* ولات داگیرکەر ☰ اشغالگر

**داگیرکاری / dagîrkarî/**: ناو. *[رامیاری]* ولات‌گری؛ دۆخی زاڵ بوونی رامیاری، سەربازی و ئابووری ولات یا هێزێک بە سەر ولات یا نەتەوەیەکی بێ‌دەسەڵاتدا ☰ اشغالگری

**داگیرکراو / dagîrk(i)raw/**: ئاوەڵناو. ١. بە زۆر سێندراو ٢. *[رامیاری]* تایبەتمەندی ولات یا سەرزەمینێ کە لە ژێر دەسەڵات و هێزی سیاسی و سەربازی ولاتێکی‌تر بەڕێوە دەچێت ☰ ١. غصب‌شده ٢. اشغال شده

**داگیرکەر / dagîrker/**: ئاوەڵناو. بە زۆرسێن ‹ڕێبەندانی ڕێنوێنە/ لە داگیرکەر سەرشێوێنە «سوارە»› ☰ اشغالگر

**داگیرکەرانە / dagîrkerane/**: ئاوەڵکار. بە زۆر؛ زۆری؛ زۆرەکی ☰ غاصبانه

**داگیریاگ / dagîryag/**: ☜ **داگیراو-١**

**داگیریان / dagîryan/**: چاوگ. ١. ☜ **داگرسان** ٢. ☜ **داگیران -١** ٣. جەمامشکێن بوون؛ کوتران و گران بوونی لەش لە بەر کار یا نەخۆشی ☰ ١. ☜ **داگرسان** ٢. ☜ **داگیران -١** ٣. کِرخ شدن

**داگێران / dagêřan/**: ☜ **داگەڕان**

**دال / dal/**: ناو. ١. ناوی عەرەبی پیتی دەیەمی ئەلفبای کوردی ٢. جار؛ کەڕەت ٣. بەردی نیشانە لە بەردەفڕکێدا ☰ ١. دال ٢. دفعە؛ بار ٣. سنگ آماج در نشانه‌گیری

**دالستن / dalistin/**: چاوگ. دالیسان؛ دالیستن؛ دالێستن؛ لە سەرەوە بۆ خوار لستنەوە ☰ فرولیسیدن

**دالقان / dal(i)qan/**: ☜ **دالەقان**

**دالقاندن / dal(i)qandin/**: ☜ **دالەقاندن**

**دالکان / dal(i)kan/**: چاوگ. دالکیان؛ پێوەنووسان؛ چەسپان؛ چەسپیان ☰ چسبیدن

**دالکاندن / dal(i)kandin/**: چاوگ. دالکانن: ١. پێوەنووساندن ٢. داکوتان و توند کردن ‹دا تو خوا دووگمەی ئەم کراسەم بۆ دالکنە!› ☰ ١. چسباندن ٢. نصب کردن

**دالکانن / dal(i)kanin/**: ☜ **دالکاندن**

**دالکاو / dal(i)kaw/**: ئاوەڵناو. دالکیاگ؛ پێوەنووساو ☰ چسبیده

**دالکیاگ / dalikyag/**: ☜ **دالکاو**

**دالکیان / dalikyan/**: ☜ **دالکان**

**دالۆ / dalo/**: ئاوەڵناو. ناحەزی چرچ (پیرێژن) ☰ بدقیافه (پیرزن)

**دالوو / dalû/**: ناو. ١. ☜ **دالآن** ٢. *[توێکاری]* پێکهاتەیەکی پێچەڵپێچ لە ئەندامانی جەستەدا، وەک گوێ، دڵ و... ☰ ١. ☜ **دالآن** ٢. دهلیز

**دالووشاندن / dalûşandin/**: ☜ **دالووشین**

**دالووشکاندن / dalûşkandin/**: ☜ **دالووشین**

**دالووشین / dalûşîn/**: چاوگ. دالووشاندن؛ دالووشکاندن؛ لووش کردن؛ مش کردن؛ لووت سڕین ‹لووتت دالووشە!› ☰ فین کردن

**دالە / dale/**: ناو. دوابین؛ پێشگۆ؛ هەواڵدەر لە داهاتوو ☰ پیشگو

**دالەقان / daleqan/**: چاوگ. دالقان؛ هەڵواسران ☰ آویخته شدن

**دالەقاندن / daleqandin/**: چاوگ. دالقاندن؛ هەڵاوەسین؛ شتێ بە شتێکی بڵندەوە کردن ☰ آویختن

**دالەقاو / daleqaw/**: ئاوەڵناو. هەڵواسراو ☰ آویخته

**دالیا / dalya/**: ناو. گوڵێکە ☰ از گُل‌ها

**دالیان / dalyan/**: ناو. لاساری؛ سووری و پێداگری لە سەر مەبەست ☰ لجاجت

**دالیسان / dalîsan/**: ☜ **دالستن**

**دالیستن / dalîstin/**: ☜ **دالستن**

**دالینگ / dalîng/**: ناو. قانوون؛ یاسا ☰ قانون

**دالینگۆک / dalîngok/**: ناو. یاسانامە؛ نامیلکەی قانوون ☰ قانون‌نامە

**دالێستن / dalêstin/**: ☜ **دالستن**

**داڵ**[1] **/ dał/**: ناو. ١. داڵاش؛ هولیلک؛ داڵەگورگە؛ داڵەکەرخۆر؛ داڵەکەرخۆرە؛ داڵەکەرخوەرە؛ خەرتل؛ خەرتەل؛ ڕەشەداڵ؛ قەرتاڵ؛ لاشخۆر؛ لاشەوەر؛ باڵندەیەکە لە تۆرەمەی هەڵۆیان، لە خێزانی داڵاشەکان، ٩٧ تا ١٠٥ سانتی‌میترە، وەک شانەکووڕە دەچێ بەلام سەری گەورەتر و دەندووکی ئەستوورترە، کلکی درێژ و سێ‌سووچ، ملی ڕووت و چێرەیی ئاماڵ‌شینە و پۆلێک تووکی قاوەیی لێ ڕواوە، لە کێو و دەشتی زۆر دوور لە ئاوەدانی، بە تەنیا دەژی ٢. داڵگە؛ شار؛ گوڵ لە کایەی ڕاوڕاوان و چاوشارەکێدا؛ ئەو شوێنەی بۆ تێوەچوون دیاری دەکرێ ☰ ١. لاشخور ٢. قلعە (در چند بازی مانند قایم‌باشک)

**داڵ**[2]: ئاوەڵناو. ١. تەنک ‹ئەم هێشووە داڵە، ئەویان پڕە› ٢. لەڕ؛ لاواز ☰ ١. تُنُک ٢. لاغر

⊡ **داڵ بوون**: لاواز بوون؛ لەڕ بوون ☰ لاغر بودن

**داڵ ـ داڵ کردن**: لەت ـ لەت کردن ☰ تکە ـ تکە کردن

**داڵ ـ**[3]: پێشوشە. ١. کەم؛ هەندک ‹داڵگۆشت› ٢. کەوانەیی؛ چەماوە ‹داڵبڕ› ☰ ١. اندک ٢. کمانی

**داڵ**[4]: پیرۆ. ← **دڕک‌وداڵ**

**داڵاش / dałaş/**: ☜ **داڵ**[1]**ـ١**

**داڵان / dałan/**: ناو. داڵوو؛ ڕێگەی بە دیواری سەرداپۆشراو ☰ دهلیز

⊡ **داڵان دۆرەپ**: *[پلار]* ژنی درێژی لاواز ☰ زن دراز لاغر

**داڵاندار / dałandar/**: ناو. پاسەوانی کاروانسەرا و ماڵەگەورە ☰ سرایدار

**داڵانداری / dałandarî/**: ناو. ١. پیشەی چاوەدێری هەمار و گاراژ ٢. کرێی باری هەمارکراو ☰ ١و ٢. انبارداری

**داڵانەڕێ / dałanerê/**: ناو. قومەش؛ تونێل ☰ تونل

**داڵاهو / dałaho/**: ☜ **داهۆڵ ـ١**

**داڵبڕ / dałbiř/**: ناو. ١. بڕشتی کەوانەیی لە جلکدا ٢. ☜ **ددانە ـ١** ☰ ١. دالبُر ٢. ☜ **ددانە ـ١**

**داڵبەخش / dałbexş/**: ☜ **دابەش**

**داڵبەش / dałbeş/**: ☜ **دابەش**

**داڵتە / dałte/**: ناو. پارتی؛ واسیە؛ داژدار؛ پاڵپشت؛ پشتیوانی بەدەسەلات ☰ پارتی

**داڵداڵان / dałdałan/**: ناو. گەمەیەکی بەکۆمەڵ و دوو بەرەکییە، داڵی تێدا دیاری دەکرێ ☰ نوعی بازی تیمی

**داڵداڵەکۆسە / dałdałekose/**: ناو. زیقاوە ☰ خروس کولی

**داڵدە / dałde/**: ناو. پەنا؛ ئەنوا ‹بارزانی داڵدەی ئازادی/ داسی هەژگەلی بێدادی «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ پناه

⊡ **داڵدە دان**: پەنا دان؛ حاواندنەوە لە ژێر پەنای خۆدا ‹چەند داڵدە دەدەی بە بێ‌پەنایان/ دەسپڕ کە بەرێ دەکەی گەدایان «هەژار، *مەموزین*»› ☰ پناه دادن

**داڵدە هێنان**: پەنا هێنان ☰ پناه آوردن

**داڵدەخواز / dałdex(i)waz/**: ناو. پەنابەر؛ پەناهێناو ☰ پناهندە

**داڵغە / dałğe/**: ناو. زەین؛ بیر ☰ ذهن

**داڵقان / dałqan/**: ناو. شۆڕ بوونەوە ☰ آویزان شدن

**داڵقوڕ / dałqûř/**: ناو. سەرکان؛ پێشەوا؛ سەرپەل ☰ سرسلسلە

**داڵک / dałik/**: ☜ **داڵگ**

**داڵکەپیران / dał(i)kepîran/**: ناو. کەنگری لاسک باریک و تاڵ ☰ کنگر ساقه باریک تلخ

**داڵکەدزان / dał(i)ked(i)zan/**: ☜ **دایکەدزە**

**داڵکەمارانە** / dał(i)kemarane/: ☜ **دایکەمار**

**داڵگ** / dałig/: ناو. داڵک؛ دایک؛ دێ؛ دیا؛ جیا ‹داڵگ نیشتیە، دایەن لە خوەی چی «مەسەل»› ☰ مادر

**داڵگۆشت** / dałgoşt/: ناوەڵناو. ڕەقەڵە؛ لاواز؛ لەجەر. هەروەها: **داڵگۆشتی** ☰ لاغر

**داڵگە** / dałge/: ناو. داڵ؛ شار؛ گوڵ لە گەمەدا ☰ مقصد در بازی

**داڵنگ** / dałing/: ناو. قانوون؛ یاسا؛ پێودان ☰ قانون

**داڵۆ** / dało/: ☜ **داهۆڵ ـ١**

**داڵۆزان** / dałozan/: ☜ **داڵوچان**

**داڵۆسکە** / dałoske/: ناو. چلوورە؛ شووشەسەهۆڵ ☰ دنگاله

**داڵوت** / dałût/: ناو. داڵیت؛ داربەست؛ داریێ کە مێوی پێوە هەڵدەسپێرن ☰ داربست درخت

**داڵوچان** / dałûçan/: چاوگ. داڵووچیان؛ داڵۆزان؛ شۆڕ بوونەوە ☰ فروهشتن

**داڵوچانن** / dałûçanin/: چاوگ. داهێشتن؛ شۆڕ کردنەوە ☰ فروهشتن

**داڵوچکە** / dałûçke/: ناوەڵناو. داڵووچە؛ داڵووزکە؛ داهێلراو؛ شۆڕەوەکراو ☰ فروهشته

**داڵوچە** / dałûçe/: ☜ **داڵوچکە**

**داڵوچیان** / dałûçyan/: ☜ **داڵوچان**

**داڵوزکە** / dałûzke/: ☜ **داڵوچکە**

**داڵە** / dałe/: ناو. باخچەی بەر ماڵان ☰ باغچەی جلو منزل

**داڵەڕوچکە** / dałeřûçke/: ناوەڵناو. شۆڕ؛ داشۆڕیاگ ☰ آویزان

**داڵەسورە** / dałesûre/: ناو. پیرۆزە؛ سوورەداڵ ☰ هُما

**داڵەکەرخورە** / dałekerxore/: ☜ **داڵ[1]ـ١**

**داڵەکەرخۆر** / dałekerxor/: ☜ **داڵ[1]ـ١**

**داڵەکەرخۆرە** / dałekerxore/: ☜ **داڵ[1]ـ١**

**داڵەگورگە** / dałegurge/: ☜ **داڵ[1]ـ١**

**داڵەواز[1]** / dałewaz/: ناو. زیندەوار؛ گیاندار ☰ جاندار

**داڵەواز[2]**: ناوەڵناو. لە سەر پێ ڕاوەستاو ‹چنوور داڵەواز بۆژانە خەمبار/ ئێساڵ کۆچەکەت نەلوانۆ هەوار «فولکلۆر»› ☰ روی پا ایستاده

**داڵەهۆ** / dałeho/: ☜ **داهۆڵ ـ١**

**داڵهۆ** / dałho/: ☜ **داهۆڵ ـ١**

**داڵیت** / dałît/: ناو. ١. ☜ **داڵوت** ٢. دار تریێەک کە بە قەد داریێتردا هەڵگەڕابێ ☰ ١. ☜ **داڵوت** ٢. مَو پیچان

**داڵیە** / dał(i)ye/: ناو. سی پێوانە لە خەرمان کە لە دار لەلە دەکرێ ‹ئێستە وەک زانیومە هەر کەس ڕوو لە داڵدەی ئێوە کا/ خەرمەنی هەستی بە با چوو، ڕۆژێ سەد داڵیەی دەوێ «حەریق»› ☰ سی پیمانه از خرمن

**دام** / dam/: ناو. ١. داو؛ داف؛ داوی ڕاو ‹دەست زەلیلش گرد بە زامەوە/ پەرێ دانەی خاڵ بی وە دامەوە «خانای قوبادی»› ٢. جێگەی ئاغا لە دامەدا ٣. /کینایە/ دارایی زۆر ٤. داب؛ ڕەوشتی ناو کۆمەڵ ☰ ١. دام؛ تله ٢. بالاترین خانه در بازی دامه ٣. ثروت زیاد ۴. عُرف

**داما** / dama/: ☜ **دامە**

**دامار** / damar/: ☜ **دەمار**

**داماری** / damarî/: ناو. داماک؛ زڕدایک؛ باوەژن؛ ژنباڤ ☰ پدرزن

**داماسی** / damasî/: ناو. جۆرێ قوماشی باش ‹جەرسە و حەریر و داماسی حەوت ڕەنگ/ نەخش و نیگاری ئەرژەنگ و ئەوڕەنگ «حەقیقی»› ☰ نوعی پارچەی مرغوب

**داماک** / damak/: ☜ **داماری**

**داماگ[1]** / damag/: ناو. کەلپورەی؛ ڕووەکێکە لە

تـیرەی نـەعنا، ٨٠ سـانتیمیتـر بـەرز دەبـێ، گەلاکانی تووکنی نووکتیژە، گولـی شـین یـان ئەرخوانی دەر دەکا 🕮 مریم چمنی

**داماگ[٢]**: ☜ **داماو**

**داماگی / damagî/**: ☜ **داماوی**

**داماڵان / damałan/**: چاوگ. داماڵـیان؛ داماڵـران: ١. لە سەرەوە بۆ خـوار داخـزان ٢. داکـەنران ٣. ئاوەڕووت بوونی مریشـک 🕮 ١. برکنـده شـدن ٢. پایین کشیده شدن ٣. آبروت شدن

**داماڵران / damałran/**: ☜ **داماڵان**

**داماڵیاگ / damałyag/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* داماڵـیگ؛ سێبەندی؛ بێحەیا و شەرم 🕮 بیشرم و آبرو

**داماڵیان / damałyan/**: ☜ **داماڵان**

**داماڵیگ / damałîg/**: ☜ **داماڵیاگ**

**داماڵین / damałîn/**: چـاوگ. داملانـدن: ١. لـە سەرەوە بۆ خوار داخزاندن ‹پێستی لە بەر داماڵە!› ٢. شێلانی بە دەست ‹تۆزێک پشـتم داماڵـە!› ٣. داکەنـدن ‹دەرپێکـەی داماڵـی› ٤. *[مەجاز]* لـێس دانی مەنجەڵ و دیزە بە دەست ‹ئـەو دیـزە چـی پێوە ماوە دایماڵـە!› ٥. ئاوەڕووت کردنی مریشـک 🕮 ١. برکنـدن ٢. مـالش دادن ٣. پـایین کشـیدن ۴. ستُردن ۵. آبروت کردن

**دامان[١] / daman/**: چـاوگ. تێمان؛ تێـدامان؛ تێـدا مانەوە؛ قەتیس بوون؛ مـات و سـەرگەردان بـوون ‹ڕۆحەکەم بۆ دەرنەچێ بـۆ گوڵشـەنی فـەوتاوی تـۆ/ ئـەی وەتـەن چـۆن دانـەمێنم؟ وا کـز و دامـاوی تـۆ «قانع»› 🕮 درماندن

**دامان[٢]**: ناو. ١. دامێن؛ پاڵـداوێن؛ پێدەشـت؛ بنـار ‹غارێک دیم نە چاک دامان کۆیێ/ چەنی بیگلـەران، خەسرەوان خۆیێ «زەبـوونی»› ٢. دامـوو؛ دامـەن؛ دامێن؛ داوێن؛ چاک ‹هەمیشە سوژدەگـاهم خـاکی بەر دەرگانەکەی تۆیە/ ڕەقیب ڕووڕەش بێ چون ناڵێ بگا دەستم بە دامانت «مەسـتوورە»› 🕮 ١. دامنـه ٢. دامن

**دامانێ / damanê/**: ☜ **دامه**

**داماو / damaw/**: ئاوەڵـناو. داماگ؛ تێماو؛ قـەتیس؛ ئەرامەندە؛ مات و سەرگەردان ‹یەکنەفەس چاکی نەهێنا کەعبەتەینی بەختەکەم/ شـەشـدەرم گـیراوە، داماوم بە دەستی نەردەوە «تاهیربەگ»› 🕮 درمانده

**داماوی / damawî/**: نـاو. داماگی؛ تێماوی؛ مـاتی و سەرگەردانی 🕮 درماندگی

**دامران / dam(i)ran/**: ☜ **دامردنەوە**

**دامراندن / dam(i)randin/**: ☜ **دامرکاندن**

**دامردن / damirdin/**: ☜ **دامردنەوە**

**دامردنـەوە / damird(i)newe/**: چـاوگ. دامـران؛ دامردن؛ تەمران؛ کز و خەفە بـوون و کوژانـەوەی ئاگر ‹گۆڕاوم، وێنەی جـاران نـەماوم، بینـایی چـاوم/ عەشـقت لـە دڵـما دامردۆتـەوە، بی تـین و تـاوم «بێکەس»› 🕮 فروکش کردن و خاموش شدن آتش

**دامردوو / damirdû/**: ئاوەڵناو. ١. دامرکاو ٢. کـوژاو 🕮 ١. آرامگرفته ٢. خاموش

**دامرکـان / damirkan/**: چـاوگ. تێنەپەڕ. //دامرکـای؛ دادەمرکێـی؛ دامرکـێ// داتـەمریان؛ دامرکیـان؛ دامـرکین: ١. داسـەکنان؛ هـەدادان ٢. نـەمانی گڕی ئاگر 🕮 ١. آرام گرفتن ٢. فروکش کردن آتش

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: دامرکـاو/ چـاوگی نـەرێنی: دانەمرکان

**دامرکانـدن / damirkandin/**: چــاوگ. تێــپەڕ. //داتمرکانـد؛ دادەمـرکێنی؛ دامرکێنـە// دامرکـانن؛ دامراندن: ١. داسەکناندن؛ هێور/ ئـارام کردنـەوە ‹بە سـوارۆیێک بـە حـەیرانێک، دامرکێنـە بلێسـەی دەرد› ٢. نەهێشتنی ئـاگر ‹دامرکاندنـی ئاورەکـە سێ ڕۆژی خایانـد› 🕮 ١. آرام کـردن ٢. فرونشـاندن آتش

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: دانەمرکاندن

**دامرکانن / damirkanin/**: ☜ **دامرکاندن**

**دامرکاو / damirkaw**/: ئاوەڵناو. دامردوو؛ داتەمریاگ؛ کوژاوە ☰ آرام گرفته

**دامرکیان / damirk(i)yan**/: ☜ **دامرکان**

**دامرکین / damirkîn**/: ☜ **دامرکان**

**دامرکێن / damirkên**/: ئاوەڵناو. داسراکێن؛ ئارامکەرەوە ☰ آرام‌بخش

**دامژین / dam(i)jîn**/: چاوگ. هەناسە دەردانەوە ☰ پس دادن بازدم

**دامسقە / damisqe**/: ☜ **داموس**

**دامشتە / damişte**/: ناو. برێشکە؛ بۆدراو؛ دانەوێڵەی لە سەر ساج برژێنراو ☰ دانەی بوداده

**دامله[1] / damle**/: ناو. گوێلکی نێری دووساڵە ☰ گوسالەی نر دوساله

**دامله[2]**: ئاوەڵناو. شەپلە لێکەوتوو ☰ فلج

**دامله‌چەقان / damleçeqan**/: ناو. دامنەچەقان؛ نوەگوان؛ نێنگوین؛ مانگای بەرکەڵ؛ چێڵی سێ ساڵان ☰ تلیسه؛ ماده گاو سه ساله

**داملاندن / dam(i)łandin**/: ☜ **داماڵین**

**دامنەچەقان / damneçeqan**/: ☜ **دامله‌چەقان**

**دامنێ / dam(i)nê**/: ☜ **داوێن**

**دام‌ودەزگا / dam û dezga**/: ناو. دەم‌ودەزگا؛ دەزگا: ١. کۆشک؛ قەسر؛ خانووی بەرز و تەرز ٢. *[کینایە]* حوکمەت و دامەزراوەکانی ٣. *[کینایە]* شوێن و کەلەستەی ڕابواردن ☰ ١. کاخ ٢. دستگاه حکومتی ٣. امکانات رفاهی

**دام‌ودەستوور / dam û destûr**/: ناو. تەکووزی؛ ڕێک‌وپێکی ☰ نظم و ترتیب

**داموس / damus**/: ناو. دامسقە؛ داموسک؛ داموسکە؛ مووی کلکی یەکسم ☰ موی دُم ستور

**داموسک / damusk**/: ناو. ١. ☜ **داموس** ٢. چەند لۆ بادراوی بەنی باریک کە دەبێتە شریت و کەندر ☰ ١. ☜ **داموس** ٢. ریسمان

**داموسکە / damuske**/: ☜ **داموس**

**دامۆچانن / damoçanin**/: چاوگ. ١. دنە دان؛ هان دان ٢. دەسەمۆ کردن ☰ ١. برانگیختن ٢. رام کردن

**دامۆران / damoran**/: چاوگ. دامۆریان: ١. لەوەڕانی مەڕان؛ خەریکی لەوەڕان بوون ٢. *[مەجاز]* سەرگەرم بوونی کەسێ بەتایبەت منال ☰ ١. سرگرم چریدن شدن ٢. سرگرم شدن

**دامۆریان / damoryan**/: ☜ **دامۆران**

**دامو / damû**/: ☜ **دامان[2]ـ٢**

**داموچانن / damûçanin**/: چاوگ. وەرگەڕاندنەوەی قەراغی جل‌وبەرگ و ڕایەخ و ... بۆ دەرەوە ☰ تا کردن لبەی لباس و فرش و ...

**داموس / damûs**/: ناو. دامووسک؛ داوموسک؛ قاتمە؛ مووی کلکی یەکسم ☰ موی دُم ستور

**داموسک / damûs(i)k**/: ☜ **داموس**

**داموسکان / damûskan**/: چاوگ. پێوەبوون؛ پێوە هەلاوەسین؛ پێوەنووسان ☰ چسبیدن

**دامە / dame**/: ناو. داما؛ دامانێ؛ یارییەکی دووکەسییە لە سەر ڕووپەڕی شەترەنج دەکرێ ☰ بازی دامیه

**دامەرزان / damerzan**/: ☜ **دامەزران**

**دامەرزاندن / damerzandin**/: ☜ **دامەزراندن**

**دامەرزانن / damerzanin**/: ☜ **دامەزراندن**

**دامەرزیان / damerz(i)yan**/: ☜ **دامەزران**

**دامەزران / damezran**/: چاوگ. تێنەپەڕ. //دامەزرای؛ دادەمەزرێ؛ دامەزرێ// دامەرزان؛ دامەرزیان: ١. جێگیر بوون ‹شوکر لە ماڵی تازەیاندا دامەزران› ٢. بۆ سەر کار وەرگیران ‹چوار کەس لەم فەرمانگەیەدا دامەزرا› ٣. کار پێ کران ‹هێشتا ئەم قانوونە دانەمەزراوە› ٤. ڕێک‌کەوتنی شتێک لە شوێنێ ‹دامەزرانی وێندۆزی دە› ٥. دەست پێ کران؛ وەگەڕ کەوتن ‹شەڕ دامەزرا و شادی باری کرد› ٦. *[مەجاز]* هاوسەر گرتن؛ چوونە سەر ماڵ و ژیانی

خۆ ‹ساڵی پار کچێک و کوڕێکم دامەزران و ئێستە لە سەر ماڵی خۆیانن› ١. مستقر شدن ٢. استخدام شدن ٣. برقرار شدن ۴. نصب شدن ۵. شروع شدن ۶ ازدواج کردن؛ سروسامان گرفتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: دامەزراو/ چاوگی نەرێنی: دانەمەزران

**دامەزراندن** / damezrandin/: چاوگ. تێپەڕ. //داتمەزراند؛ دادەمەزرێنی؛ دامەزرێنە// دامەرزانن؛ دامەرزاندن: ١. جێگیر کردن ‹سەرەنجام لە ماڵە تازەکە دایانمەزراند› ٢. بۆ سەر کار وەرگرتن ‹چوار کەسم لەم فەرمانگەیەدا دامەزراند› ٣. کار پێ کردن ‹هێشتا ئەم قانوونەیان دانەمەزراندووە› ٤. ڕێکخستنی شتێک لە شوێنێ ‹دامەزراندنی ویندۆزی دە› ٥. دەست پێ کردن؛ وەگەڕ خستن ‹شەڕیان دامەزراند و شادیمان باری کرد› ٦. *[مەجاز]* هاوسەر بۆ گرتن؛ نانە سەر ماڵ و ژیانی خۆ ‹ساڵی پار کچێک و کوڕێکمم دامەزراند و ئێستە لە سەر ماڵی خۆیانن› ١. مستقر کردن ٢. استخدام کردن ٣. برقرار کردن ۴. نصب کردن ۵. شروع کردن ۶ صاحب همسر کردن؛ سروسامان دادن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ــــ/ چاوگی نەرێنی: دانەمەزراندن

**دامەزراو** / damezraw/: ناو. بەپا؛ بەرپا؛ بەرقەرار برپا

**دامەزراوە** / damezrawe/: ناو. پێکهاتە؛ ڕێکخراوە بُنیاد

**دامەزراوی** / damezrawî/: ناو. شەنگست؛ پرنسیب؛ جێکەوتوویی پرنسیب

**دامەلاغاس** / damelağas/: ئاوەڵناو. تالان کراو؛ پوورکری غارت‌شده

**دامەن** / damen/: ☜ **دامان[2]ـ٢**

**دامەنهەڵکراو** / damenhełk(i)raw/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* بێ‌شەرم و حەیا (ژن) ‹بووکی دنیا وەک دەڵێن وا بێ حەیا و بێ‌فەڕ نەبوو/ هێندە دامەن‌هەڵکراو و حیز و ماڵانگەڕ نەبوو «حاجی قادر»› پاچه ورمالیده

**دامەهر** / dameh(i)r/: ناو. زڕداک؛ باوەژن مادرزن

**دامی** / damî/: ☜ **داو[1]ـ٢**

**دامێن** / damên/: ناو. ١. داوێن؛ دامووی؛ دامەن؛ چاک ٢. پاڵداوێن؛ بنار؛ داوێنی کێو ‹سەری فەرهادم و دەندووکی قولنگ/ دەستی مەجنوونم و دامێنی چیا «نالی»› ١. دامن ٢. دامنه‌ی کوه

⊡ **دامێن گرتن**: ١. *[کینایە]* پەنا بردن و تکا کردن لە کەسێ ‹بچۆ دامێنی بگرە! ئەوە خوایە لێت خۆش بێ› ٢. ناچار تووشی بەڵا بوون ‹تا ئەم نەخۆشییە دامێنی نەگرتبووم ئەوەندەی سێ کەس کارم دەکرد› ١. پناه بُردن و التماس کردن ٢. گرفتار شدن

**دامێن‌پاکی** / damênpakî/: ناو. خەنەکچان؛ بێ‌گەردی پاکدامنی

**دامێن‌پیس** / damênpîs/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دامێن‌تەڕ؛ داوێن‌تەڕ؛ داوێن‌پیس؛ شواڵ‌پیس؛ داوشکەستی؛ شواڵ‌چەپەڵ؛ زیناکار زانی؛ دامن‌آلوده

**دامێن‌تەڕ** / damênteř/: ☜ **دامێن‌پیس**

**دامێن‌تەڕی** / damênteřî/: ناو. *[مەجاز]* فین؛ ژنبازی زنبارگی

**دامێنگیر** / damêngîr/: ئاوەڵناو. داوێنگیر؛ تووشیار؛ دوچار؛ ئاوقا؛ هاوقا؛ تووش‌هاتوو ‹هودهودی دڵ حەبسی بەلقیسی سەبای دیوە یەقین/ خۆی کە دامێنگیری شاهی ئاسەفی سانی دەکا «نالی»› گریبانگیر

**دان[1]** / dan/: چاوگ. تێپەڕ. //دات؛ دەدەی؛ بدە// ١. داین؛ بەخشین ٢. کوتان ١. دادن ٢. زدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەدان

**دان**[٢]: ناو. ١. خۆراکی مریشک و باڵندەی ماڵی ٢. خەلە؛ تۆمی هەر گیایەک کە زۆرتر لە ناو کالانێکدایە و ماکی خواردنی پێویستی لەگەڵە ‹دەخل و دان› ٣. تۆم؛ توو ‹گەنمەکە دانی نییە› ٤. ☜ **ددان** ٥. کڕ؛ وەرز؛ هەرەت ٦. نێوان (کاتی) ‹دانی سبەینە؛ دانی ئێوارە› ☰ ١. دان؛ خوراک ماکیان ٢. غلّه ٣. تخم ۴. ☜ **ددان** ۵. موسم ۶. وسط؛ میان (زمانی)

⊡ **دان ئاڵ بونەوە** ☜ **ددان ئاڵ بونەوە**

**دان تیژ کردن** ☜ **ددان تیژ کردن**

**دان جیڕ کردنەوە** ☜ **ددان جیڕ کردن**

**دان سپی بونەوە** ☜ **ددان سپی بونەوە**

**دان سەح کرن** تێ‌گەیاندن ☰ فهمانیدن

**دان کردن** ١. دەنک پەیدا بوونی خەلە ٢. ددان دروست کردن ٤. دەرهێنانی دان لە کەلووی دەغڵ ٤. داوەراندن؛ پاک کردنی هەنار ☰ ١. دانه کردن غله ٢. دندان درست کردن ٣. پاک کردن غلّه ۴. دان کردن انار

• **دان**[٣]: پاشگر. جێ ‹خوێدان؛ قەلاغدان› ☰ ـ دان

**دان‌ئاژن** / dan'ajin/: ناو. ددان‌ئاژن؛ هلال ☰ خلال دندان

**دان‌ئێشە** / dan'êşe/: ناو. ددان‌ئێشە ☰ دندان‌درد

**دانا** / dana/: ئاوەڵناو. ١. زانا؛ زانیار ٢. دەهەندە؛ دانیار ☰ ١. دانا ٢. بخشنده

**دانار** / danar/: ☜ **داندار**

⊡ **دانار کردن** دان کردن؛ لێک کردنی دانەکانی هەر شتێ (وەک: هەنار) ☰ دان کردن

**دانار ـ دانار** / danar danar/: ئاوەڵناو. دانە ـ دانە؛ دەنکە ـ دەنکە داوەستاو؛ باش تێکەڵ نەبوو ‹چێشتەکە دانار ـ دانار ببوو› ☰ از هم بُریده

**داناره** / danare/: ناو. جۆرێک وێنجەی خۆرسکی پێدەشت و لەوەڕگا و ڕخی جۆگە و ڕووبارانە، گوڵی مەیلەو پەمەیی دەر دەکا، لەگەڵ گیا سێپەڕەدا ئالفێکی بە سوودە بۆ مەڕ و ماڵات ☰ یونجه‌هلالی

**داناژن** / danajin/: ناو. دیاناژن؛ پووشکەی کەلێنە ددان کۆڵینەوە ☰ خلال‌دندان

**داناش** / danaş/: ناو. دانەوێڵەی تایبەت بۆ هاڕین ☰ بنشن برای آرد کردن

**دانامه** / daname/: ناو. ماش‌وبرنج؛ مووی سپی و ڕەشی تێکەڵاو ☰ موی جوگندمی

**دانان** / danan/: چاوگ. تێپەر. //داتنا؛ دادەنێی؛ دانە//دانیان؛ دانین: ١. نیان؛ نان؛ نەییش؛ نیایرە؛ نانە سەر شتێک ‹گوێ نەدەی هەرگیز بە هاشە و هووشەیی ئەربابی زەڕ/ هەڵگرە ئەم دەستە شیعرە و دابنێ سەد سەوڵی تەڕ! «قانع»› ٢. دۆڕاندن ‹چوو بۆ ڕیش سمێڵی دانا «مەسەل»› ٣. نووسینی کتێب ‹بۆ کتێب دانان لەگەڵ تەرجەمە/ هەرچەند تێکۆشین هێشتا هەر کەمە «بێخود»› ٤. گریمانە/ فەرز کردن ‹ئەی مەهی چاردە سەیری مەیی دوو هەفتە بکە!/ وەک منی دابنێ! چاوی من و تۆ ئاگەنە یەک «حاجی قادر»› ٥. هێشتنەوە؛ لا نەبردن ‹سمێڵی داناوە› ٦. *(مەجاز)* واز هێنان؛ تەرک کردنی کار یان ئاکارێ ‹سیگاری دانا› ☰ ١. نهادن ٢. باختن ٣. تألیف کردن ۴. فرض کردن ۵. گذاشتن ۶. ترک کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: دانەنان

**داناو** / danaw/: ناو. ١. ئاودێری دەغڵ بۆ دەنک قەڵەو بوون ‹بەلام بەڵ تەڵ تەڵ گەشێوە کەرۆ/ نەی ئاخرەوە داناوێ وەرۆ «مەولەوی»› ٢. یەکەم ئاو کە لە مەشکەی دەکەن ☰ ١. آبیاری برای درشت شدن غلّه ٢. اولین آب که در مشک ریزند

**دانبۆری** / danborî/: ناو. چۆنیەتی زۆر خواردنی دوای هەستانەوە لە نەخۆشی ☰ پُرخوری بعد از شفا یافتن

**دانپزیشک** / danp(i)zîşk/: ☜ **ددان‌پزیشک**

**دانپزیشکی** / danp(i)zîşkî/: ☚ **ددانپزیشکی**

**دانخۆر** / danxor/: ئاوەڵناو. خــووگر بــە خــواردنی دان وەکوو خوراک ⊑ دانەخوار

**داندار** / dandar/: ئاوەڵناو. دانار؛ چردانــە؛ پــڕبار ⊑ پُردانه (غله)

**داندانۆکە** / dandanoke/: ناو. گیایەکــە ⊑ گیـاهی است

**داندران** / dand(i)ran/: ☚ **دانران**

**داندراو** / dand(i)raw/: ☚ **دانراو**

**داندوک** / danduk/: نـاو. دەنووک؛ دەمی باڵندە ⊑ نوک؛ منقار

**داندۆقە** / dandoqe/: ناو. کەرەکێوی ⊑ گورخر

**داندۆک** / dandok/: نــاو. گــەنم و دۆکەشــکی وشکەوەکراو ⊑ خشکاندەی گندم و دوغ‌کشک

**داندۆڵ** / dandoł/: ناو. گێچەڵ ⊑ هَچَل

**داندووک** / dandûk/: ناو. دانوو؛ دانەوێڵەی لە ئـاودا کوڵاو ‹شاهی کە نەبێ ڕادەبوێرین بــە گــەدایی/ بـۆ ئەهلی قەناعەت لە پـلاو خۆشـترە دانـدووک «شـێخ ڕەزا»› ⊑ دانەی آب‌پز

**دانران** / dan(i)ran/: چاوگ. داندران؛ دانریـان: ١. نرانــە زەوی ‹ســێ بــاریش لێــرە دانــراوە› ٢. هەڵگیران؛ هێشتنەوە ‹ئەوە بۆ زستان دانـراوە› ٣. پەسند کران ‹دوو قانوونی تازە ئەمـڕۆ لــە پارلـەمان دانرا› ٤. ڕاسپێردران ‹بەبێ ئاژاوە و بێ‌شەڕ و هەرا/ لەسەر شارانا والی دانرا «قانع»› ⊑ ١. نهاده شـدن ٢. نگهداشته شدن ٣. تصویب شدن ۴. منصوب شدن

**دانراو** / danraw/: ئاوەڵناو. دانـدراو: ١. دۆڕاو ٢. دەسنیا ⊑ ١. باخت شده ٢. نهاده شده

**دانریان** / daniryan/: ☚ **دانران**

**دانڕسکێ** / danřiskê/: ناو. ددانەچیـرە؛ دیانەکـرێ ⊑ دندان‌قروچه

**دانڕیچ** / danřîç/: ئاوەڵناو. ددان‌گـڕ؛ ددانی پـێش وەک کەروێشگ دەرپەڕیو ⊑ دندان خرگوشی

**دانڕێوی** / danřêwî/: نـاو. ددانــەڕێوی؛ خشڵــێکە زێڕینگەران سازی دەکەن ⊑ نوعی زیور

**دانزلین** / danzlîn/: چـاوگ. هەراســان بــوون ⊑ عاصی شدن

**دانساز** / dansaz/: ☚ **ددانساز**

**دانستە** / daniste/: نـاو. تایبەتمەنـدی؛ گەوشـین؛ چۆنیەتی یان نیشانەی تایبەت ⊑ ویژگی

**دانسقە** / danisqe/: ئاوەڵناو. ١. کەموێنە؛ نایاب ٢. تایبەت؛ تایبەتی ⊑ ١. نایاب ٢. ویژه

**دانسینگ** / dansîng/: ناو. سەماگە؛ ژووری تایبەتی هەڵپەڕکێ و سەما لە ڕستووران یـان کابـارەدا ⊑ دانسینگ

**دانک** / danik/: ناو. دەنک؛ دانە؛ لب ⊑ دانه

**دانکە** / danke/: نـاو. دانیــە؛ ســۆکە؛ خرووکــەی مریشک؛ ئاوڵەی مەل؛ نەخۆشییەکی ڤایرووســی زۆر گیرۆیە پتر منالان تووشی دەبن ⊑ آبله‌مُرغان

⊡ **دانکە دەردان** ئاوڵە لێ‌هاتنی مەل و مریشک ⊑ آبله زدن مرغ

**دانکەل** / dankel/: ئاوەڵـناو. ددان‌شـکاو یـان ددان کەوتوو ⊑ دندان‌شکسته

**دانگ** / dang/: نـاو. ١. شەش‌یەکی هەر شتێک ٢. شەش‌یەکی مسقاڵ ٣. *[مووسیقا]* نیـوەی گامێـک ⊑ ١. دانگ ٢. یک ششم مثقال ٣. دانگ

**دانگا** / danga/: ئاوەڵکار. دەمێک؛ تاوێک ⊑ لختی؛ دمی

**دانگانە** / dangane/: نـاو. بــەهرەی دانگێــک لــە ملک ⊑ بهره‌ی یک دانگ از ملک

**دانگۆ** / dango/: ئاوەڵکار. لـە بـڕە ‹دانگـۆ نرختێکـی گوت› ⊑ فله‌ای

⊡ **وە دانگۆ** بە هەڕەمە؛ وە بڕە ‹وە دانگـۆ سـەندم› ⊑ فله‌ای

**دانگۆیی** / dangoyî/: ناو. کاری نان خواردنی چەن کەس پێکەوە ⊑ عمل غذا خوردن چند کس با هم

**دانگو**[١] / dangû/: ناو. دانوو؛ کاکڵە تاڵەی کـوڵاو و سپی کراوی بادام و شێلانە ☰ هستەی تلخِ پختە و پوست‌کندەی بادام و زردآلو

**دانگو**[٢]: ئاوەڵناو. جیاـجیا ☰ مُتفرق

**دانگە** / dange/: نـاو. ١. جێگەی گیا بـۆ خـستنی ئاژەڵ لە زستاندا ٢. خواری ئـاوایی ☰ ١. علفگـاه بیرون آغُل در زمستان ٢. پایین آبادی

**دانگیـر**[١] / dangîr/: نـاو. ١. چیکەنـــە؛ ئـــامرازی پەمۆدانە گرتن ٢. نەخۆشی ئاژەڵ لە دەخڵی زۆر خواردن ☰ ١. ابزار پنبه پاک‌کنـی ٢. بیمـاری دام از پرخوری

**دانگیر**[٢] / dangîr/: ئاوەڵـناو. باش نەکوڵاو (دانەوێڵە) ☰ نیم‌پختە (دانە)

**دانمـان** / dan(i)man/: چـاوگ. داتـــەپین ☰ گــود افتادن

**دانماندن** / dan(i)mandin/: چاوگ. داتەپانـدن ☰ گود انداختن

**دان‌مەلـــوچک** / danmelûçik/: نـــاو. گیایـــــەکی خۆڕسکە، گوڵێکی زەردی بچووک دەکـا ☰ گـل آفتابی اروپایی

**دانوان** / dan(i)wan/: ☜ **دانەواندن**

**دانواندن** / dan(i)wandin/: ☜ **دانەواندن**

**دانوانن** / dan(i)wanin/: ☜ **دانەواندن**

**دان‌وسان** / dan û san/: ☜ **دان‌وستان**

**دان‌وســـتان** / dan û s(i)tan/: نـاو. دان‌وســـان؛ ئاڵوویر: ١. مامڵە؛ کاری کڕین و فرۆتن ٢. بدە و بستێنە؛ بدە و بێنە؛ ئەو پەیوەندییە کە بەم بۆنەوە پێک دێت ‹تا ئێستا لەگـەڵ ئـەودیو دان‌وسـتانمان نەبووە› ☰ ١. دادوستد ٢. بده و بستان

**دانۆک** / danok/: ناو. شەوەر؛ شـەبدەر؛ شـەوەرگ ☰ شبدر

**دانۆکە** / danoke/: نـاو. تـۆی کـەنگر؛ تـۆمی نـاو قانگەلاشک ☰ کنگردانە

**دانۆکەقـەڵا** / danokeqeła/: نـــاو. کاهووەکەرانــــە؛ جاوبازە؛ شینەشەنگاڵ؛ شەنگاڵ؛ شەنگار؛ پێکـۆترە؛ چەرمـــەژووری؛ گوڵەئەشــکەوت؛ ڕوەکێکــە لــە خێزانی گۆزروان، ڕەگ و ڕیشەکەی وەک ڕەنگـی سروشتی بە کار دێنن، گوڵێکی شین ـ ئەرخەوانی دەر دەکا ☰ شنگار

**دانۆکەکـەنگر** / danokekengir/: نـاو. سیســی ☰ کنگردانە

**دانو** / danû/: ناو. ١. دانەوێڵەی لە ئاودا کوڵاو ٢. نەخۆشییەکی بزن ٣. دانی؛ دەنکـی کـوڵاو ☰ ١. دانەی آبپز ٢. از بیماری‌های بُز ٣. دانەی آب‌پز

**دانوراشتن** / danûraştin/: ☜ **دانوشتاندن**

**دانوسـان** / danûsan/: چـاوگ. پێـدا نووســـان ☰ چسبیدن

**دانوســـاندن** / danûsandin/: چـــاوگ. پێـــــدا نووساندن ☰ چسباندن

**دانوشـتان** / danûştan/: چـاوگ. ١. قــەد بــوون؛ لایەک بە سەر یەکتردا هاتن ٢. بـە سـەر یەکـدا دووران ٣. داچەمان ☰ ١. تا شدن ٢. بر هم دوختـه شدن ٣. خم شدن

**دانوشتاندن** / danûştandin/: چاوگ. دانووراشتن؛ دانووشـتانن: ١. قەد کردن؛ دوو لا بە سەر یەکـدا هێنان ٢. بە سەر یەکدا دوورین ٣. داچەمانـدن ☰ ١. تا کردن ٢. بر هم دوختن ٣. خم کردن

**دانوشتانن** / danûştanin/: ☜ **دانوشتاندن**

**دانوشتانەوە** / danûştanewe/: چاوگ. داهاتنـەوە ☰ خم شدن

**دانوشتاو** / danûştaw/: ئاوەڵناو. قەدکراو ☰ تاشده

**دانوکـە** / danûke/: نـاو. نەخۆشــییەکی مەلــە ☰ نوعی بیماری پرندگان

**دانولـە** / danûle/: ناو. ١. دانەکولانـە؛ دانەڕووتـە؛ دیانەکولانــە؛ ددانــەڕۆ؛ دانەڕۆکــە؛ دیــانڕۆکلـە؛ چێشــتی تێکــەڵاوی هــەموو جــۆرە دانەوێڵــە و

گۆشت و پیواز، کە بە بۆنەی دەرهاتنی هەوەڵین ددانی زارۆوە لـێ دەنـرێ ٢. دانـوو؛ دانەوێڵـەی کولاو ٣. گیایەکە ◼ ١. آش دندانی ٢. دانەی آب‌پز ٣. گیاهی است

**دانـه / dane/**: نـاو. ١. دانـک؛ دەنـک؛ دەنـدک؛ یەکەی ژماردن ‹چوار دانـە کـەو؛ دانەیـەکیان دیـار نەبوو› ٢. یەکە؛ هەرکام لـە ئەنـدامانی گرۆیـەک ‹ئەم دانە؛ ئەو دانە› ٣. ئاسنی لغاو کە دەچێتە نـاو زاری یەکسـەوە ٤. تەختـەی لای ژوورەوەی مەرەزە ٥. ددانە و گرێی هەرە ٦. شەی تەون ٧. دەرمانی ڕەنگ بۆ ڕەنگ کردنی بەران ٨. تانـەی چاو ٩. یەشم؛ شەوە؛ شـەوەی سـەوز؛ بـەردێکی گرانبایی کەسکی تۆخە کـە زۆر ڕەق و تۆکمەیـە ◼ ١. عدد؛ واحد شمارش ٢. دانه ٣. دهنەی لگـام ۴. قسـمت بـالای شـالیزار ۵. دندانـەی ارّه ۶ شـانەی بافندگی ٧. رنگ ویژەی رنگ کردن قـوچ ٨ لکـەی چشم ٩. یشم

**دانـەبژێر / daneb(i)jêr/**: ناوەڵـناو. تـەڵبژێر؛ تەلبژێن؛ هەڵبژاردە ◼ برگزیده

**دانەبەر / daneber/**: ناو. دەسـتەبەر؛ بـەرعۆدە ◼ ضامن

**دانەبەزە / danebeze/**: ناو. مەمکی ژن یـا گـوانی وڵاخ و ئاژەڵان لە کاتی وشک کردنـدا ◼ پسـتان شیرده زمانی که خشک شود

**دانەبێرە / danebêre/**: ☜ **ڕانەبێرە**

**دانەجیرێ / danceîrê/**: ناو. دیانەکیـرە؛ دانەچیـر؛ دیان‌ڕیچەکێ ◼ دندان‌قروچه

**دانەچۆقـە / daneçoqe/**: نـاو. ددانەچرۆقـەـه؛ تەقەتەقی ددانان لە سەرما یان لە تا لێ هـاتن ◼ حالت به هم خوردن دندان‌ها از سرما یا تب و لرز

**دانەچۆلەکـە / daneçoleke/**: نـاو. گیایەکـه ◼ گیاهی است

**دانەچیر / daneçîř/**: ☜ **دنوڕیچە**

**دانـەچیرە / daneçîře/**: نـاو. ١. دیانەکیـرە؛ دیانەڕیکێ؛ کاری ڕێک‌خشانی ددانان و سیرە لێ هاتنیان ٢. هەڕەشـە ‹دانەچیـرەی گـورگی هـاری سەر لاکم/ زاتی گیانی نەلەرزیوم لەق ناکا! «گۆران»› ◼ ١. دندان‌قروچه ٢. تهدید

**دانەخاڤ / danexav/**: ناو. گەنمی کـوتراو و لـەت بوو ◼ گندم نیمکوب

**دانەخۆرە / danexore/**: ناوەڵناو. دانەکەوە؛ چەشت؛ چەشتە؛ دەمەچەشتە؛ دەمەچێشتە؛ چەشـەخۆر؛ چەشـتەخۆر؛ چێشـتەخۆر؛ چەشـتەخۆرە؛ خووگرتوو بە وەرگرتنی شتێک، بـا کـەمیش، لـە دیتران ‹زولفی، داوی عاشقان و کولمی، جێڕاوگەی دلان/ دانەخۆرەن بولبولان لەو جووتە خاڵـی دڵـبەرە «ئاوات»› ◼ چشته‌خور

**دانە ـ دانە[١] / dane dane/**: ناوەڵـناو. دانـار ـ دانـار؛ دەنک ـ دەنک؛ یەک لە دووی یەک و جیا ـ جیا ‹دانە ـ دانە خاڵ، دانە ـ دانە› ◼ یکی ـ یکی

**دانە ـ دانە[٢]**: ناوەڵکار. دانار ـ دانار؛ دەنک ـ دەنک؛ بە شێوازێکی یەک لە دووی یـەک و جیـا ـ جیـا ‹دانە ـ دانە بژاردم› ◼ یک به یک

**دانە ـ دانە[٣]**: جێناو. یەکە ـ یەکە ‹دانە ـ دانەیـەکیان گەڕانەوە› ◼ تک و توک

**دانەدۆ / danedo/**: ناو. دۆکولیو؛ دۆخەوا؛ دۆخوا ◼ دوغبا؛ آش دوغ

**دانـەر / daner/**: نـاو. ١. کەسـێ کـە شـتێ لـە شـوێنێک دادەنـێ ٢. داهێنـەر؛ ئافرێنـەر ٣. بناغەداڕێژ و دروست‌کەر ٤. نووسەر ◼ ١. گذارنده ٢. خالق ٣. بنیانگذار ۴. مؤلف

**دانەڕۆکە / daneřoke/**: ☜ **دانولە-١**

**دانەڕووتە / daneřûte/**: ☜ **دانولە-١**

**دانەڕەشکە / daneřeşke/**: ناو. گیایەکـە گەڵاکـەی وەک گوێ بەرخۆلە وایە، بستێک لە زەوی بـەرز دەبێتەوە و گولی چێرەیی دەردەکا، دانەکەی لـە

ڕەشکە دەکا گیاهی است

**دانەڕیز / daneřîz/**: ناو. کاری دانە ڕژانە ناو ئاردەوە لە ئاسیاو دانەی گندم‌ریز در آسیاب

**دانەزانین / danezanîn/**: چاوگ. تێگەیاندنی خەڵک بۆ فەرمان و کارێ اعلام کردن

**دانەسکناو / danesiknaw/**: ☞ دانەسەکاو

**دانەسەکاو / danesekaw/**: ئاوەڵناو. دانەسەکناو؛ دانەسکناو؛ بێئۆقرە؛ بێئارام بی‌آرام

**دانەسەکناو / daneseknaw/**: ☞ دانەسەکاو

**دانەقوو / daneqû/**: ناو. گەنمەکوتراو گندم کوبیده

**دانەقەتێ / daneqetê/**: ناو. گیایەکە گیاهی است

**دانەک / danek/**: ناو. بەخشش بخشش

**دانەکوڵانە / danekułane/**: ☞ دانوولە-١

**دانەکەوە / danekewe/**: ☞ دانەخۆرە

**دانەلغاو / danel(i)ğaw/**: ناو. ئەو ئاسنەی لغاو کە دەچێتە ناو دەمی یەکسم دهنه‌ی لگام

**دانەلۆق / daneloq/**: ناو. شێوی سەوزی و گەنمەکوتاو آش سبزی و گندم نیمکوب

**دانەلەقلەق / daneleqleq/**: ناو. تۆڵەکە؛ نانەحاجیلە پنیرک

**دانەماش / danemaş/**: ناو. مووی ماش‌وبرنجی موی جوگندمی

**دانەمە / daneme/**: ناو. مووی سپی دانە- دانە لە ناو مووی ڕەشی ڕیشدا تارهای سفید مو در ریش

**دانەوان / danewan/**: ☞ دانەوین

**دانەواندن / danewandin/**: چاوگ. دانواندن؛ دانوان؛ دانەوانن: ١. چەماندنەوە ‹دای بە سەر بەفرا شەبیخوون، بوو بە ئاردی نێو دروو/ داینەواند پشتی کلیلە، ڕایرفاند مەئمووری با «ئاوات»› ٢. *[مەجاز]* لە کێشەدا تەسلیم بوون ‹عیراق لە هەمبەر خواستی گەلی کورد داینەواندووە› ١. خم کردن ٢. کوتاه آمدن

**دانەوانن / danewanin/**: ☞ دانەواندن

**دانەوگەزۆ / danewgezo/**: ناو. ناوی شیرینییەکی خۆماڵی شاری سنەیە، لە گەنم و گەزۆ دروست دەبێ از شیرینی‌ها

**دانەوە / danewe/**: چاوگ. تێپەڕ. //داتەوە؛ دەدەیەوە؛ بدەوە// ١. گەڕاندنەوە؛ دانەدواوە ٢. کەندن؛ هەڵکەندن؛ کۆڵین ١. بازپس دادن ٢. کندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەدانەوە

**دانەوین / danewîn/**: چاوگ. دانوان؛ دانەوان؛ دانەوینەوە؛ چەمینەوە؛ بەرەو خوار نەوی بوون خم شدن

**دانەوینەوە / danewînewe/**: ☞ دانەوین

**دانەوێر / danewêr/**: ناو. دەغڵ؛ غەلە غلّه

**دانەوێڵە / danewêłe/**: ناو. دانێڵە؛ دڕکەدوو؛ ئازووخەی وشک وەک نیسک و نۆک و ... ‹خێر و خۆشی زۆر، دەغڵ و دانی باش/ دانەوێڵەی چاک، نیسک و نۆک و ماش «هەژار، *بۆکوردستان*»› بُنشن؛ غلات؛ حبوبات

**دانەوێڵەفرۆش / danewêłef(i)roş/**: ناو. خەڵەفرۆش غلّه‌فروش

**دانەهەڤ / danehev/**: چاوگ. کۆ کردنەوە جمع کردن

**دانەیەک / daneyek/**: جێناو. دانەیێک؛ دانێک؛ دەنکێک؛ دەنکێ؛ دانێ: ١. یەکێکی نەناسراو ‹دانەیەک هاتبوو شەڕی دەفرۆشت› ٢. یەک دانە لە تاقمێک ‹دانەیەکیان دانەنیشتن› ١و٢. یکی؛ کسی

**دانەیی / daneyî/**: ئاوەڵکار. بە دانە؛ دانە ــ دانە ‹دانەیی دەیفرۆشن› دانه‌ای

**دانەیێک / daneyêk/**: ☞ دانەیەک

**دانهێڕ / danhêř/**: ناو. دانهێـڕک؛ گـەنمی کوتـاو؛ گەنمی کڕەکراو 🇮🇷 گندم کوبیده

**دانهێڕک / danhêřik/**: ☜ دانهێڕ

**دانی**[1] **/ danî/**: ناو. دانوو؛ دەنکـی کـوڵاو 🇮🇷 دانـەی آب‌پز

**دانی**[2]: ئاوەڵناو. دابەستە 🇮🇷 پروار

**دانیار / danyar/**: ئاوەڵناو. دەهندە 🇮🇷 بخشندە

**دانیان / dan(i)yan/**: ☜ دانان

**دانیاو / danyaw/**: ئاوەڵناو. بـەزیو؛ دۆڕاو؛ بـەزیاگ 🇮🇷 مغلوب

**دانیشاندن / danîşandin/**: چاوگ. ڕوونشتاندن 🇮🇷 نشاندن

**دانیشتگ / danîştig/**: ☜ دانیشتو[2]

**دانیشتن / danîştin/**: چاوگ. ١. ڕۆنیشتن؛ نیشتن ٢. *[نەرمەنگی خەڵکی]* ڕۆنیشتن بۆ خەلا کـردن 🇮🇷 ١. نشستن ٢. نشستن برای دست به آب

**دانیشتنەوە / danîşt(i)newe/**: چـاوگ. ڕۆنیشـتن دوای هەڵسان 🇮🇷 دوباره نشستن

**دانیشتو**[1] **/ danîştû/**: ناو. نیشتەجێ ‹گەر جووتیـار ئارەق نەڕێژێ، گەر هەتاو تیشک ناوێژێ/ دانیشتووی ناو کۆش و قەلا، دەخۆن نانی گەلا گەلا؟ «هـێمن»› 🇮🇷 ساکن

**دانیشتو**[2]: ئاوەڵناو. دانیشتگ: ١. ڕۆنیشتی؛ نیشتوو ‹مـنی دانیشـتوو چـۆن دەسـتم پـێ دەگـا؟› ٢. نیشتەجێ ‹چەند سالـە دانیشـتووی سـنەم› 🇮🇷 ١. نشسته ٢. مقیم

**دانیشتووان / danîştûwan/**: ناو. خەڵـک؛ خەڵـق؛ خەڵکان 🇮🇷 اهالی؛ ساکنین

**دانیغڵان / danîğ(i)łan/**: چـاوگ. خپ بوون؛ مـات بوون 🇮🇷 مبهوت شدن

**دانیک / danîk/**: نـاو. دانـوو؛ دانوولـە؛ دانەوێڵـەی کوڵاو 🇮🇷 دانەی آب‌پز

**دانین / danîn/**: ☜ دانان

**دانیە / danye/**: ☜ دانکە

**دانێ**[1] **/ danê/**: ناو. چێشتەنگاو 🇮🇷 چاشتگاه

**دانێ**[2]: ☜ دانەیەك

**دانێر / danêr/**: ناو. حاکم؛ ئەوەی حوکم دەکـا 🇮🇷 حاکم

⊡ **دانێر کرن**: لێپرسینەوە؛ باس‌وخواس کـردن 🇮🇷 مُحاکمه کردن

**دانێک / danêk/**: ☜ دانەیەك

**دانێڵە / danêłe/**: ☜ دانەوێڵە

**داو**[1] **/ daw/**: نـاو. ١. هەودا؛ تـا؛ تـاڵ ٢. داڤ؛ دام؛ دامی؛ هـەر چەشـنە ئامێرێـک بـۆ دیـل کـردنی کەسێ یان گرتنی گیاندارێک ٣. فێڵ؛ گزی؛ گەڕ ٤. دامێن؛ داوێـن؛ دامـان ٥. جۆرێـک کایـە لـە نەردێندا ٦. *[کینایە]* چـام؛ ئەنگەمـە؛ غـوور؛ هـۆی گیر و گرفت ‹کەوتە داوی دۆستی ناباب و قوڕ چـوو بە سەریا› 🇮🇷 ١. تار، رشته ٢. دام؛ تله ٣. حُقه؛ کلـک ۴. دامن ۵. نوعی بازی نرد ۶. تله

⊡ **داو بـۆ کەسـێ داخسـتن/ نانـەوە/ نیانـەوە** *[کینایـە]* پـیلان بـۆ کەسـێ گێـڕان 🇮🇷 دام بـرای کسـی گذاشتن

**داو داخستن**: داو نانـەوە؛ تەڵـە نانـەوە: ١. تەڵـە نیانەوە؛ تەڵـە داخسـتن؛ داو چەقانـدن بـۆ ڕاو ‹ڕاوچییـەکان داویـان بـۆ ڕێـوی داخسـتبوو› ٢. *[کینایە]* پیلان گێڕان؛ نەخشە کێشـان 🇮🇷 ١. دام نهادن ٢. توطئه کردن

**داو کەفتن**: ☜ کەوتنە ناو داو

**خستنە داو**: ١. لـە تەڵـەوە خسـتن ٢. *[کینایە]* تووش کردن ‹عەیب و لـەعبی خەڵـقی کـرد تـا یاری خستە داوی خۆی/ خەسمەکەی من کـەلبی ئاهووگیرە، خیرسی لاعیبە «نـالی»› 🇮🇷 ١. بـە دام انداختن ٢. گرفتار کردن

**کەوتنە ناو داو**: داو کەفتن؛ گیران بـە داو 🇮🇷 در دام افتادن

**لە داو خەلسان:** لە داو ڕایی بوون؛ ژ داڤ ڤەڕسان؛ لە داو دەرهاتن 🇮🇷 از دام جَستن

**لە داو ڕایی بون:** ☜ **لە داو خەلسان**

**ـ داو**[٢]: پاشەوشە. ١. بەخش ‹خواداو› ٢. کەوتوو ‹ڕووداو› 🇮🇷 ١و٢. ـ داد

**داوا / dawa/:** ناو. ١. داخواز ‹داوای شانە لە کەچەڵ ئەکا! «مەسەل»› ٢. شەڕ و هەرا ‹دوای مەرافە و داوا و تووسەری/ کەم کەم کار کیشیت وە کەلانتەری «شامی»› ٣. خوازبێنی ‹چووینە داوای کەنیشکەکەیانەو بۆ کوڕەکەمان› 🇮🇷 ١. طلب ٢. دعوا؛ جنگ ٣. خواستگاری

◘ **داوا کردن:** ١. خواستن؛ ویستن ‹زابیتەی تەبعم سوارە، ئیددیعای شاهی هەیە/ موحتەشەم دیوانە، داوای تەختی خاقانی دەکا «نالی»› ٢. شەڕ کردن ٣. خوازبێنی کردن ‹وا بنووسین: یا وەسڵ بۆ یەکتری یا خاکی گۆڕ!/ هەرکەسێ داوات بکا، بێسوودە، خۆی ڕیسوا ئەکا «قانع»› 🇮🇷 ١. خواستن ٢. دعوا کردن ٣. خواستگاری کردن

**داواچی / dawaçî/:** ☜ **داواکار ـ١**

**داواران / dawaran/:** ☜ **دابارین**

**داوارانن / dawaranin/:** ☜ **داباراندن**

**داوارین / dawarîn/:** ☜ **دابارین**

**داواکار / dawakar/:** ناو. داواکەر: ١. داواچی؛ ئەو کەسەی خواستێک دێنێتە گۆڕێ ‹داواکار دەڵێ ئەمە هی منە› ٢. خوازبێن؛ خوازبێنیکەر؛ هێجیکار؛ ئەوەی خوازیاری کچ یان ژنێکە (بۆ خۆی یا کەسێکی دی) ‹چەند داواکاری بووە، بەلام شوو ناکا› 🇮🇷 ١. مدعی ٢. خواستگار

◘ **داواکاری گشتی:** دادستان؛ دادئەستێن 🇮🇷 مدعی‌العموم؛ دادستان

**داواکاری / dawakarî/:** ناو. خوازەکی؛ داخوازی 🇮🇷 طلب

**داواکراو / dawak(i)raw/:** ئاوەڵناو. خوازراو؛ نۆبەخت 🇮🇷 خواستەشدە

**داواکەر / dawaker/:** ☜ **داواکار**

**داواڵ / dawał/:** ناو. ١. ☜ **داهۆڵ ـ١** ٢. لقە گەنمی بە پاوە جێماو لە پەرێز 🇮🇷 ١. ☜ **داهۆڵ ـ١** ٢. ساقەی درونشدە در مزرعە

**داواڵیان / dawałyan/:** چاوگ. توند و لەناکاو بانگ لێ هەڵسان 🇮🇷 ناگهانی فریاد زدن

**داوان / dawan/:** ناو. ١. دامەن؛ دامێن؛ داو ٢. خوازبێنیکەر 🇮🇷 ١. دامن ٢. خواستگار

**داوانامە / dawaname/:** ☜ **داخوازنامە**

**داوباز**[١] **/ dawbaz/:** ناو. ڕاوچی بە داو 🇮🇷 صیاد با دام

**داوباز**[٢]: ئاوەڵناو. گزیکار؛ گزدەر؛ گزەون 🇮🇷 حقەباز

**داوبەسەت / dawb(i)set/:** ناو. داوسەت: ١. دانوستان؛ مامڵە ٢. هان و هوون؛ کار و ڕەوتی سامان دان 🇮🇷 ١. دادوستد ٢. عمل یا فرایند ترتیب دادن

**داوتەنکە / dawtenke/:** ناو. جاڵجاڵووکە؛ کاکلەمووشان 🇮🇷 عنکبوت

**داوتەنە / dawtene/:** ناو. جاڵجاڵۆکە 🇮🇷 تارتنک؛ عنکبوت

**داوچەقێن / dawçeqên/:** ناو. داولێدەر 🇮🇷 دام‌گُذار

**داوخواز / dawx(i)waz/:** ناو. داخاز: ١. هەمەت؛ کەسێ کە بە خواستی خۆی ئامادەی ئەنجامی کارێ دەبێ ٢. خوازبێنیکەر. هەروەها: **داوخوازی** 🇮🇷 ١. داوطلب ٢. خواستگار

**داوخوازکەر / dawx(i)wazker/:** ئاوەڵناو. دادبەر؛ دادخواز؛ سکاڵابەر؛ گلیکار 🇮🇷 شاکی؛ دادخواه

**داوداوەکۆستە / dawdawekoste/:** ناو. زیقاوە؛ زیقاوڵە 🇮🇷 خروس کولی

**داوداوەکۆسە / dawdawekose/:** ناو. زیقاوە؛ زیرزیقاوڵە؛ زیقاوڵە 🇮🇷 خروس کولی

**داوداوی / dawdawî/:** ناو. جاڵجاڵووکە؛

کاکڵەمووشان ☰ عنکبوت

**داودۆز / dawdoz/**: ناوەڵناو. داودۆزەرەوە: ١. تایبەتمەندی مەلێ کە هەست بە داو دەکا ٢. [کینایە] داوباز؛ گەڕساز؛ فێڵەباز ☰ ١. ویژگی پرنده‌ای که دام را حس می‌کند ٢. حیله‌گر

**داودۆزەرەوە / dawdozerewe/**: ☜ **داودۆز**

**داودەرمان / dawderman/**: ناو. ١. داک و دەوا؛ دەوا و دەرمان ٢. هاتوچۆی لای بژیشک بۆ چابوونەوە ‹ساڵێکە خەریکی داودەرمانم› ٣. بەهارات؛ ئالات و زەردەچێوە ☰ ١. دارو و درمان ٢. معالجه ٣. ادویه

**داودەلینگ / dawdleîng/**: ناو. پەلپیز؛ لنگ و لەتەر؛ داودەلینگ ☰ ساق و پوشش ساق

**داودی / daw(i)dî/**: ناو. ١. داویتی؛ گوڵەداودی؛ گوڵەداویتی؛ گوڵەزووفا؛ گوڵەزۆفا؛ ڕووەکێکی ڕازێنەری یەک یان چەن ساڵەیە لە پاییزاندا دەڕوێ، گوڵەکەی چەن ڕەنگ و شێوە و کەمپەڕ و زۆرپەڕی هەیە ٢. جۆرێ قوڵەباڵتە ☰ ١. گُل داودی ٢. نوعی تنپوش

**داودێرۆنکل / dawdêronkil/**: ☜ **داوودێرۆنکل**

**داوران / daw(i)ran/**: چاوگ. قووت دان ☰ قورت دادن

**داورین / daw(i)rîn/**: چاوگ. گیرسانەوە؛ سەقامگیر بوون ☰ مُستقر شدن

**داوڕ / dawiř/**: ☜ **دابڕ**[2]

⊡ **داوڕ کردن**: ☜ **دابڕ کردن**

**داوڕین / daw(i)řîn/**: ☜ **دابڕین**

**داوزاندن / daw(i)zandin/**: ☜ **دابەزاندن**

**داوزانن / daw(i)zanin/**: ☜ **دابەزاندن**

**داوزیان / dawizyan/**: ☜ **دابەزین**

**داوزین / daw(i)zîn/**: ☜ **دابەزین**

**داوژار / daw(i)jar/**: ↓

⊡ **داوژار کردن**: بەرگوزار کردن؛ خستنە ڕێ ☰ برگزار کردن

**داوسەت / dawset/**: ☜ **داوبسەت**

**داوشکەستی / dawş(i)kestî/**: ☜ **دامێن‌پیس**

**داوک / dawik/**: ناو. ١. ☜ **داوگە** ٢. دەزوو؛ بەن ٣. سیپە؛ بۆسە ☰ ١. ☜ **داوگە** ٢. نخ ٣. کمین

**داوکە / dawke/**: ☜ **داوگە**

**داوگە / dawge/**: ناو. داوکە؛ داوک؛ تەڵەگا؛ کختان؛ جێداو؛ جێتەڵە؛ جێتەپکە؛ ئەو شوێنە بۆ ڕاو داوی لێ دەنێنەوە ☰ دامگاه

**داولێدەر[1] / dawlêder/**: ناو. داوچەقێن؛ ئەوی داو دەنێتەوە ☰ دام‌گذار

**داولێدەر[2]**: ناوەڵناو. [کینایە] فێڵباز؛ گزیکار ☰ حقه‌باز

**داوڵ / dawił/**: ☜ **داهۆڵ ـ١**

**داوڵین / daw(i)łîn/**: چاوگ. ١. تریت کردن؛ نان دە شۆربا کوشین ٢. دە سەر یەک ئاخنین ٣. تۆم و دەنک کوتان و جوێ کردنەوە ‹ئیمڕۆ سیاوڵەکەم داوڵی› ☰ ١. ترید کردن ٢. بر هم انباشتن ٣. نوعی بوجاری

**داوموسک / dawmûsk/**: ☜ **داموس**

**داووددێرۆنکل / dawuddêronkil/**: ناو. داودێرۆنکل؛ داوودێدوینکل؛ پەپووسێمانە ☰ هُدهُد

**داوودێدوینکل / dawudêd(i)wînkil/**: ☜ **داووددێرۆنکل**

**داووسیان / dawusyan/**: چاوگ. ئاوا بوون؛ لە بەر چاو ون بوون ☰ غروب کردن؛ ناپدید شدن

**داوەت / dawet/**: ناو. دەوەت: ١. هەڵپەڕکێ؛ ڕەقس؛ دیلان؛ گۆبەند ٢. زەماوەن؛ زەماوەند؛ شایی ☰ ١. رقص ٢. جشن عروسی

⊡ **داوەتی جندۆکان**: ☜ **داوەتەجنۆکە**

**داوەتگێڕ / dawetgêř/**: ناو. کای کەردۆخ؛ کەسێ کە زۆر باش هەڵدەپەڕێ ☰ رقاص

**داوەتەجنۆکە / dawetec(i)noke/**: ناو. داوەتی

جنـدۆکان؛ بـاهۆز؛ گێژەڵـووکە؛ گـەردەلوول 🇮🇷 گردباد

**داوەتەنـە** / dawetene/: نـاو. جاڵجاڵـووکە 🇮🇷 عنکبوت

**داوەدەزوو** / dawedezû/: ناو. تەرفک؛ پارچـەدەزوو 🇮🇷 تکەنخ

**داوەر** / dawer/: ناو. ١. ☜ **دادوەر** ٢. کەسێ کـە لە کێبـەرکێی وەرزشـیدا دادوەری دەکـا تـاکوو یاریزانان لـە یاسـای یـاری لا نـەدەن 🇮🇷 ١. ☜ **دادوەر** ٢. داور

**داوەران** / daweran/: ☜ **داوەرین ـ١**

**داوەرانـدن** / dawerandin/: چـاوگ. داوەرانـــن؛ داوەرڤاندن؛ دڵۆپ ـ دڵـۆپ یـان وردە ـ وردە لـە بەرزەوە ڕژاندنە خوار 🇮🇷 فروریختن

**داوەرانن** / daweranin/: ☜ **داوەراندن**

**داوەرزین** / dawerzîn/: ☜ **داوەرین ـ١**

**داوەرڤاندن** / dawervandin/: ☜ **داوەراندن**

**داوەرڤین** / dawervîn/: ☜ **داوەرین ـ١**

**داوەرووکان** / dawerûkan/: چاوگ. تێوەرهاتن؛ لە سەر شتێ کۆ بوونەوە و کەڵەکە کردن 🇮🇷 گرد هم آمدن

**داوەریان** / daweryan/: ☜ **داوەرین**[1]

**داوەریـــــن** / dawerîn/: چـــــاوگ. ١. داوەران؛ داوەرزین؛ داوەرڤین؛ داوەریان؛ لە ژووروو ڕا بەرەو خـوار ڕژان ‹فرمێسـکێکم لـە چـاو داوەری و بـیری زەمانی جـوانی و منداڵـیم وەک فیلمـی سـینەمایی هاتـەوە بـەرچاو... «هـەژار، چێشـتی مجێـور»› ٢. شۆڕەوە بوون 🇮🇷 ١. فروریختن ٢. فروهشتن

**داوەرینەوە** / dawerînewe/: چاوگ. هاتنە ژوورەوە ‹پـاش نـوێژێکی شـەوانێکی درەنـگ، ئیـدریس و پێشمەرگە و ئەحمەدتەوفیق و مـەلاباقی داوەرینـەوە «هەژار، چێشتی مجێور»› 🇮🇷 سر و کلە پیدا شدن

**داوەریو** / dawerîw/: ناو. هەڵـوەریو؛ هەڵـوەراو 🇮🇷 فروریختە

**داوەڕێس** / daweřês/: ناو. ١. هاوریشمی نەڕێسراو ٢. جـۆرێ کووتـاڵ 🇮🇷 ١. ابریشـم خـام ٢. نـوعی کرباس

**داوەزان** / dawezan/: ☜ **دابەزین**

**داوەزاندن** / dawezandin/: ☜ **دابەزاندن**

**داوەزیان** / dawezyan/: ☜ **دابەزین**

**داوەزین** / dawezîn/: ☜ **دابەزین**

**داوەستان** / dawestan/: چـاوگ. کـەش داگـرتن ‹دووکەڵێکی چڕ لە مەتبـەخ داوەسـتاوە› 🇮🇷 احاطـە کردن؛ فرا گرفتن

**داوەستن** / dawestin/: ☜ **دابەستن**

**داوەسین** / dawesîn/: نـاو. کـەردار؛ چـارویدار؛ ولاغار؛ خەربەندە 🇮🇷 خربندە

**داوەشان** / daweşan/: ☜ **داوەشین**

**داوەشاندن** / daweşandin/: چاوگ. ١. تەکانـدنی جل لە سەر ئاور (تەندوور) ٢. بـە زەبـرەوە بـەرەو خوار هێنان ‹قامچی داوەشاند و خوێنی تـێ تزانـد› ٣. لـە بـەر یـەک هەڵوەشـاندن ‹بـەراز هـەموو مەزراکـەی داوەشـاندووە› ٤. وەشـاندنی تـۆم بـۆ چاندن ‹جووتیار ئەو کاتەی تووی داوەشاند، نیـوەی کاری کردووە› 🇮🇷 ١. تکاندن لباس بر آتـش ٢. فـرود آوردن ضربە از بالا بە پایین ٣. از هم گُسیختن ۴. بذر افشاندن

**داوەشاو** / daweşaw/: ناوەڵناو. ١. داڕزاو؛ پرتووکاو؛ لە بەر یەک هەڵوەشاو ‹قەت نەڵـێی داخـی گـرانم حاڵی گەنجیم چوو لە دەس/ تـازە پـیر و داوەشـاوم ناگەمە هاوشانی کەس «قانع»› ٢. هەنی ـ هـەنی؛ هەلا ـ هەلا؛ لە بەر یـەک چـوو ٣.*[مەجاز]* دۆڕاو؛ تێـکشـکاو؛ وە بـەر شکسـت و ناکـامی کـەوتوو ‹عیراقێکی هەڵوەشاو، حکوومەتێکی داوەشـاو› 🇮🇷 ١. پوسیدە ٢. لە و از هم پاشیدە ٣. شکستخوردە

**داوەشـاوی** / daweşawî/: نـاو. لێـــکبـــلاوی؛

لێکبەربوویی؛ دۆخ یان چۆنیەتی لێک بەر بوون ☰ از هم پاشیدگی

**داوەشیان / daweşyan/:** ☜ **داوەشین**

**داوەشین / daweşîn/:** چاوگ. داوەشان؛ داوەشیان: ١. بە زەربەوە بەرەو خوار هاتن ‹هەر قامچی داوەشا خوێن فیچقەی کرد› ٢. ڕزان و لە بەر یەک هەڵوەشان ‹یادگاری هۆزی مادە، داوەشی بۆ مامەڵەت/ لاپەڕەی مێژوو ئەنووسێ لەعنەت و ڕەفتاری تۆ «قانع»› ٣. هیلاک و نەخۆش کەوتن لە بەر ماندوویی ‹هێندەم کار کردووە، تەواو گیانم داوەشیوە› ٤. [پلار] مردن ‹ئەی داوەشی، ئەم کارەشت پێ نەکرا؟!› ٥. وەشانی تۆم بۆ چاندن ‹ئەو کاتەی توو داوەشیا، جووتیار نیوەی کاری کراوە› ☰ ١. فرود آمدن ضربه از بالا به پایین ٢. فرسوده و پوسیده شدن ٣. خسته و بیمار شدن ۴. مُردن ۵. بذر افشانی شدن

**داوەکا / daweka/:** ناو. شەڵتە؛ ڕەشکەی کاکێشان ☰ تور حمل کاه

**داوەکۆستە / dawekoste/:** ناو. زیقاوە ☰ خروس کولی

**داوەلۆکێن / dawelokên/:** ناو. یارییەکە ☰ از بازی‌ها

**داوەڵ / daweł/:** ناو. ١. ☜ **داهۆڵ ـ١** ٢. دەهۆڵ ☰ ١. ☜ **داهۆڵ ـ١** ٢. دُهُل

**داوەمشار / dawem(i)şar/:** ناو. مشاری باریک وەک موو ☰ ارّەمویی

**داوەن / dawen/:** ناو. داوێن؛ دامێن ☰ دامن

**داوی / dawî/:** ئاوەڵناو. دوایی؛ پاشین ☰ آخری

⊡ **داوی دان:** دوایی پێ هێنان ☰ خاتمە دادن

**داویتی / dawîtî/:** ☜ **داودی ـ١**

**داوین / dawîn/:** ئاوەڵناو. داوینە؛ دوایین؛ پاشین؛ پاشینە ☰ آخرین

**داوینە / dawîne/:** ☜ **داوین**

**داویە / daw(i)ye/:** ئاوەڵناو. بەردەوام؛ هەمیشە ژیو ☰ ابدی؛ جاوید

**داوێن / dawên/:** ناو. داو؛ دامان؛ دامێن؛ داوان؛ داینە؛ دەوان؛ دەمان؛ دامەن؛ دامنێ؛ داموو: ١. ئاتەگ؛ ئەتەک؛ تەشک؛ پەلە؛ شاقەل؛ بەشی خوارووی جل لە کەلەکەوە بەرەوخوار ‹داوێنی کراس؛ داوێنی کەوا› ٢. سەرکاب؛ ئاواڵ‌کراس؛ جلێکی ژنانە لە کەلەکەوە بەرەوخوار دەگرێ ‹لەم پارچەیە داوێنێکم دووری› ٣. پاڵداوێن؛ پاڵدامێن؛ پاڵداینە؛ ئەو بەشە لە شتێ کە لە داوێندا جێی دەبێتەوە ‹داوێنی گوڵ› ٤. پاڵداوێن؛ پاڵدامێن؛ دەرەتان؛ پاڵداینە ‹داوێنی دەشت و چیا› ☰ ١تا۴. دامن

⊡ **داوێنی کەسێک گرتن/ گرتنەوە** [کینایە] کەوتنە بەر تاوان یان گرفتێکەوە ‹ئەم شەڕە ئاخری داوێنی تۆش دەگرێتەوە› ☰ دامن کسی را گرفتن

**داوێنپاک / dawênpak/:** ئاوەڵناو. پاکداوێن؛ دوور لە گوناح، بەتایبەت جینسی ‹کیژۆڵەی شۆخی جوانچاک/ شۆڕەژنی داوێنپاک «هێمن»› ☰ پاکدامن

**داوێنپاکی / dawênpakî/:** ناو. گوڵداوێنی؛ هێمۆیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی پاکی و ئاکارچاکی بەتایبەت لە باری نامووسییەوە ‹ئەی کچی جوان! ئەی یەزدانی داوێنپاکی/ دیلانێ بگێڕە! بە سەر چوو دیلی و زەلیلی و خەمناکی «سوارە»› ☰ پاکدامنی

**داوێنپیس / dawênpîs/:** ☜ **دامێنپیس**

**داوێنتاریک / dawêntarîk/:** ئاوەڵناو. [مەجاز] کابرەش؛ قاپڕەش ☰ پاسیاه

**داوێنتەڕ / dawênteř/:** ☜ **دامێنپیس**

**داوێنشل / dawênşil/:** ئاوەڵناو. [مەجاز] تایبەتمەندی ژنێ کە زوو خۆی بە دەستەوە دەدات ☰ ویژگی زنی کە زود تمکین می‌کند

**داوێنشۆڕ / dawênşoř/:** ناو. ئاودامان ☰ دامن‌بلند

**داوێنگیر** / dawêngîr/: ☜ **دامێنگیر**

**داوێنە** / dawêne/: ناو. بناری چیا ☰ دامنه (کوه)

**داهات** / dahat/: ناو. دەرامەت؛ دەرامەد: ١. بەرهەم؛ بەر و بووم؛ بەهرەی کشتوکاڵ ٢. دەسکەوت؛ دەخڵ؛ بارەچە؛ ئەوەی کەس یان دامەزراوەیەک لە ماوەیەکی دیاریکراودا لە هەمبەر فرۆشی کالا یا ڕاژەیەکەوە دەستی دەکەوێ ☰ ١. محصول ٢. درآمد

▣ **داهاتی سەرانە**: نێوانەی داهاتی تاکێک لە سەرجەم داهاتی وڵات ☰ درآمد سالانە

**داهاتی نەتەوەیی**: سەرجەمی داهاتی وڵاتێک ☰ درآمد ملی

**داهاتانە** / dahatane/: ناو. بەشی خاوەن مڵک لە دەرامەتی زەوی ☰ بهرەی مالکانه

**داهاتگ** / dahatig/: ئاوەڵناو. تازەپەیدابوو ☰ نوآمده

**داهاتن** / dahatin/: چاوگ. ١. نەوینەوە؛ چەمینەوە ٢. بڕانەوە بە مشار ٣. کز بوون و شێوانی چاو ‹چاوم داهاتووە› ٤. شانە کران ‹سەری بە شانە داهاتووە› ٥. کەوی بوون؛ ڕام بوون ‹دەڵێن گورگ قەت دانایە› ٦. عادەت کردن؛ خوو گرتن ‹منداڵ ئەگەر بە خراپە داهات، گەورە بوو ئەستەمە بەرەو چاکە بڕوا› ٧. تازە سەرهەڵدان؛ تازە پەیدا بوون ‹ئەوسایە موبایل دانەهاتبوو› ٨. داکەوتن؛ بوونە داب و باو ‹ئەم ڕەسمویاسایە تازە داهاتووە› ٩. داکەوتن؛ قوپانی زەمین یان بان ‹لە چەند لاوە سەربانەکە داهاتووە› ١٠. گەیشتن؛ پێ‌گەیشتن ‹تا ئەوان گەیشتنە شەرەفاباد، تاریکان داهاتبوو «هەژار، *شەرەفنامە*»› ☰ ١. خم شدن؛ خمیدن ٢. بریده شدن با ارّه ٣. بیمار شدن چشم ۴. شانه شدن مو ۵. رام شدن ۶. عادت کردن ۷. اختراع شدن ۸. مُد شدن ۹. فرورفتن بام یا زمین ۱۰. فرارسیدن

**داهاتنەوە** / dahat(i)newe/: چاوگ. نەوینەوە؛ کۆمەو بوون ☰ خم شدن

**داهاتوو**[1] / dahatû/: ناو. دواڕۆژ ‹هونەرمەند کاری ئەوەیە کە ڕێگای خەڵک ڕووناک کاتەوە و لە ڕابردوو و داهاتوو و ئێستای تێبگەیەنێ «سوارە»› ☰ آینده

**داهاتوو**[2]: ئاوەڵناو. ١. چەماوە؛ کۆم ٢. شانەکراو ٣. تازە دروست بوو ٤. خووگرتوو ‹مرۆی بە خراپە داهاتوو› ٥. نەخۆش (بۆ چاو) ٦. کەوی؛ ڕام ☰ ١. خمیده؛ دارای انحنا ٢. شانەشده ٣. اختراع شده ۴. عادت گرفته ۵. بیمار (چشم) ۶. رام

**داهاڕین** / dahaȓîn/: چاوگ. ورد کردنی شتی ڕەق؛ ئاسیاو کردن ☰ آسیاب کردن

**داهانین** / dahanîn/: چاوگ. داهاوردن؛ تازە پەیدا کردن: ١. وەدیهێنانی شتی نوێ ٢. کردنە باو ☰ ١. اختراع کردن ٢. رایج کردن

**داهاوردن** / dahawirdin/: چاوگ. ١. ☜ **داهانین** ٢. شانە کردنی موو ☰ ١. ☜ **داهانین** ٢. شانە زدن مو

**داهژاندن** / dah(i)jandin/: چاوگ. لقاندن؛ کردنە نێو قاڵب ☰ در قالب ریختن

**داهۆ** / daho/: ناو. فێڵ؛ گزی ☰ نیرنگ

**داهۆڕ** / dahoȓ/: ئاوەڵناو. فرت؛ گوشاد؛ هەراو؛ زڕ؛ زڕت ☰ گُشاد

**داهۆڵ** / dahoɫ/: ناو. ١. داڵاهۆ؛ داڵۆ؛ داواڵ؛ داوڵ؛ داڵهۆ؛ داڵەهۆ؛ داوەڵ؛ پەیکەرەی لە پووش و پەلاش لە مەزرا بۆ پەلەوەر ترساندن ٢. لقە گەنمی بە پێوە جێماوی دروێنەنەکراو ☰ ١. مترسک ٢. گندم جامانده از درو

**داهەراندن** / daherandin/: چاوگ. ئاژەڵ ناردنە سەر خوێ و ئاوێ ☰ هدایت کردن دام به آبشخور

**داهەڕستن** / daheȓistin/: چاوگ. بە سەر یەکدا لکان و لێک توند بوون ☰ با فشار بر هم چسبیدن

**داهەژ**[1] / dahej/: ناو. جووڵە؛ تەکان ☰ تکان

• **داهەژ**[2]: پاشەوشە. ـ هەژێن؛ ـ جووڵێن؛ ـ بزوێن

📖 ـ جُنبان

**داهی**[1] / dahî/: ئاوەلکار. دواتر؛ پاشتر؛ ئەوجار 📖 سپس؛ آنگاه

**داهی**[2]: سارستە. ١. ئیتر چی؟؛ دیتر چی؟ ٢. دەی ئیدی؟ 📖 ١. دیگر چە؟ ٢. پس چە؟

**داهێزان** / dahêzan/: چاوگ. داهێزران؛ داهێزیان؛ دازان: ١. لەش‌گران بوون، لە تا یان لە گەرما ‹نە بە گەرما داهێزاوە/ نە خەوی لە چاوی زاوە «هێمن»› ٢. داشۆڕان بە هۆی شل بوون (هەویر و...) 📖 ١. بی‌حال شدن ٢. وارفتن (خمیر و...)

**داهێزاو** / dahêzaw/: ئاوەلناو. خاڤەکی؛ شۆڕ 📖 کرخت؛ سُست

**داهێزاوی** / dahêzawî/: ناو. قەسف؛ تەز؛ سڕی 📖 کرختی

**داهێزران** / dahêzran/: ☜ **داهێزان**

**داهێزراو** / dahêzraw/: ☜ **داهێنراو ـ١**

**داهێزیان** / dahêzyan/: ☜ **داهێزان**

**داهێشتن** / dahêştin/: چاوگ. داهێلان: ١. بەرەو خوار شۆڕ کردنەوە ‹شەمشەکوێرە خۆی بە بن میچی ئەشکەوتەکەوە داهێشتبوو› ٢. ڕاداشتن؛ دادێران ‹ئەو مندالە داهێلە، میزی دێ› 📖 ١. فروهشتن ٢. روی دست گرفتن بچە برای شاشیدن

**داهێلان** / dahêłan/: ☜ **داهێشتن**

**داهێلدراو** / dahêłd(i)raw/: ناو. شۆڕەوەبوو؛ شۆڕەوبووگ؛ داهاتوو 📖 فروهشتە

**داهێلراو** / dahêłraw/: ئاوەلناو. دالەقاو؛ شۆڕەوەکراو 📖 فروهشتە

**داهێنان** / dahênan/: چاوگ. ١. وەدیهێنانی شتی نوێ ‹کێ ڕادیۆی داهێنا؟› ٢. کەوی کردن؛ دەستەمۆ کردن ٣. بە هەرە برینەوە ٤. شانە کردنی موو ‹قژە لووسە درێژەکەی داهێنا› ٥. خوار کردنەوەی لک و دار ‹لەو لاوە باخەکە بە میوەی زەرد و سوور لکی داهێنابوو› ٦. کردنە باو ٧. کردن؛ بە شێوەیەک دەرهێنان ‹هەتاو قیرەتاوی جادەکەی گەرم داهێنابوو› ٨. هێنانە ئاراوە ‹پێش گەیشتنی من مامۆستاکان باسێکیان داهێنابوو› 📖 ١. اختراع کردن ٢. رام کردن ٣. اره کردن ۴. شانە زدن ۵. خم کردن ۶ متداول کردن ۷. کردن ۸ پیش کشیدن

**داهێنانەوە** / dahênanewe/: چاوگ. خوار کردنەوە؛ لار کردنەوە 📖 خم کردن

**داهێنراو** / dahênraw/: ئاوەلناو. ١. داهێزراو؛ لەش‌گران لە تەو یان گەرما ٢. شانەکراو ‹مووی داهێنراو› ٣. چەمێنراو ٤. تازە داهاتوو ٥. باوکراوە؛ باوکراو 📖 ١. بی‌حال شدە از گرما یا تب ٢. شانەشدە ٣. خمانیدە شدە ۴. تازە رایج شدە ۵. مُد شدە

**داهێنەر** / dahêner/: ناو. بەدیهێنەر؛ ئافرێنەر؛ خولقێنەر؛ ڤەدان‌دەر ‹سپاس بۆ خوا کە داهێنەری جیهانە «هەژار، *قورئان*»› 📖 خالق

**دای**[1] / day/: چاوگ. داین؛ دان 📖 دادن

**دای**[2]: ناو. دایک؛ دالک 📖 مادر

**دایاخ** / dayax/: ناو. سەبر؛ پشوو 📖 صبر

**دایان** / dayan/: ☜ **دایەن**

**دایانی** / dayanî/: ☜ **دایەنی**

**دایرە** / dayre/: ناو. ١. جەغز؛ جوغز؛ بازنە ٢. ئامرازێکی مووسیقایە، وەکوو دەف بەلام چکۆلە ٣. فەرمانگە؛ مەزرینگە؛ شوێنی کارگێری دەولەت 📖 ١. دایرە ٢. ساز دایرە ٣. ادارە

◘ **دایرە لێدان**: دایرە ژەندن 📖 دایرە زدن

**دایرە ژەندن**: ☜ **دایرە لێدان**

**دایرەزەنگی** / dayrezengî/: ناو. گەوال؛ دایرەی بە زریزە 📖 دایرەزنگی

**دایسان** / daysan/: چاوگ. داییسان؛ داگرسان 📖 افروختن

**دایک**[1] / dayk/: ناو. دالک؛ دالگ؛ دالگە؛ داک؛ داکە؛ دەیک؛ دایە؛ دێ؛ دی؛ دا؛ دای؛ ئامە؛

دادیک؛ ئەیا؛ وەدا؛ ئانە؛ ئەوا؛ دادە؛ دیا؛ چا؛ داکۆ؛ ماک؛ ماکە؛ یاک؛ یایە؛ یادێ؛ یایک؛ جێ؛ جیا؛ مایە؛ مایەر؛ مای؛ مەتەر: ١. گیانداری مێوینە (بەتایبەت مرۆ)ی خاوەن بێچوو ٢. *[مەجاز]* ئەوەی شتێکی بەدیهێناوە یان بەخێوی کردووە ‹دایکی ڕۆژگار› ☰ ١و٢. مادر

▣ **دایکت بمرێ:** سارستەی نیشانەی زگسووتانی دایک بۆ منداڵی ‹ڕۆلە دایکت بمرێ! نانیان پێ نەدای؟› ☰ بمیرم الهی

**دایکی ڕۆحانی:** ڕێزناوێک بۆ ژنی لە خواترسی کڵێسە ☰ مادر روحانی

**دایکی شیری:** ژنێک جگە لە دایک کە شیری بە کەسێ دابێ ☰ مادر رضاعی

**دایکی منداڵەکان/ منداڵان:** *[سەرزارەکی]* دایک منالەکان؛ ئاماژەی پیاو بۆ ژنەکەی ‹دایکی منداڵەکان نەخۆشە› ☰ مادر بچەها

▣ **بوون بە دایک:** منداڵ هێنانە دنیا ☰ مادر شدن

**لە دایک بوون:** بوون؛ هاتنە دنیاوە؛ پەیدا بوون ☰ متولد شدن

**دایک**[٢]: ئاوەڵناو. سەرەکی؛ سەرەتایی؛ ژێدەر ‹بۆش، کۆمپانیای دایک لە بەرهەم هێنانی کەلوپەلی ناوماڵ› ☰ مادر

**دایکانە**[١] / daykane/: ناو. دایک؛ جنسی مێوینەی گیانداران ‹دایکانەکەی لە هێلانەیە› ☰ مادە (جانداران)

**دایکانە**[٢]: ئاوەڵناو. زۆر مێهرەبانانە؛ وەک دایک ‹سۆزی دایکانە› ☰ مادرانە

**دایکانە**[٣]: ئاوەڵکار. وەک دایک؛ ژیر و بە بەزەیی ‹دایکانە هەستا و منداڵەکەی پۆشتە کرد› ☰ مادرانە

**دایکبرا** / daykb(i)ra/: ناو. دوو برا کە دایکیان یەکە و باوکیان جودا ☰ برادر مادری

**دایکمردوو** / daykmirdû/: ئاوەڵناو. ١. بێ‌دایک ‹لە منداڵی دایکمردوو دەچوو› ٢. *[کینایە]* داماو؛ بەدبەخت؛ بەستەزمان ‹ئەم دایکمردووە خۆ گوناحێکی نەبوو› ☰ ١و٢. مادرمُردە

**دایکە**[١] / dayke/: ناو. ١. دایە؛ وشەی دواندنی دایک و ژنانی بە ساڵاچوو ٢. مێوینەی لە سەر جووچکان ☰ ١. کلمەی خطاب بە مادر و زنان مسن ٢. مادر جوجەها

**دایکە**[٢]: پێشوشە. سەرەکی؛ ژێدەر ‹دایکەدز؛ دایکەدەردان› ☰ مادر-

**دایکەدز** / daykediz/: ☜ **دایکەدزە**

**دایکەدزە** / dayked(i)ze/: ناو. دایکەدز؛ داڵکەدزان؛ دەسکیس؛ دزدەسەک؛ دزەکە؛ دەستەدز؛ پاش‌دز؛ دەڵاڵی دز؛ هاریکاری دز ☰ دزدافشار

**دایکەدەردان** / daykederdan/: ناو. دەرد و ئازارێ کە چەندین دەرد و ئازاری‌تری لێ دەبێتەوە ☰ دردی کە عامل دردهای دیگر است

**دایکەلێ** / daykelê/: دەنگ. دایەلێ؛ نازوشەی دواندنی دایک ☰ مادر جان

**دایکەمار** / daykemar/: ناو. دایکەمارانە؛ داڵکەمارانە؛ زەردەقوڕە؛ جۆرێ مارمێلکە ☰ نوعی مارمولک

**دایکەمارانە** / daykemarane/: ☜ **دایکەمار**

**دایکەوا** / daykewa/: ☜ **دایەحەوا**

**دایکی**[١] / daykî/: ناو. ١. بارودۆخی دایک بوون ٢. کار و کردەوەی دایکانە ☰ ١و٢. مادری

**دایکی**[٢]: ئاوەڵناو. پێوەندیدار یان سەر بە دایک ‹برای دایکی› ☰ مادری

**دایکێ** / daykê/: سارستە. مەتەرێ؛ ئەی دایک ☰ ای مادر

**دایلاخ** / daylax/: ناو. دایلاغ؛ بەچکە وشتری یەکساڵان ☰ بچەشتر یکسالە

**دایلاغ** / daylağ/: ☜ **دایلاخ**

**دایلان** / daylan/: ئاوەڵناو. ١. سەیر؛ سەمەرە ٢.

دەلال؛ زۆر جوان 🇮🇷 ۱. عجیب ۲. دلربا

**دایلەرێ / daylerê/**: ناو. گۆتەکە؛ کەوشەک؛ کایەی حەمزەل 🇮🇷 جُفتک‌چارکش

**دایم[1] / dayim/**: ئاوەڵناو. هەمیشەیی ‹کاری دایم› 🇮🇷 دایم

**دایم[2]**: ئاوەڵکار. هەمیشە ‹دایم بچیتە سەر دار، جارێ ئەکەویتە خوار «مەسەل»› 🇮🇷 دایم

▣ **دایم‌ودەرهەم**: دایمەی خوا؛ دایمەودەرهەم؛ هەموو کات؛ هەمیشە ‹قامکەکانی پەنجەی شین، دایم‌ودەرهەم لێک دوور بوون، خۆپەسند و ناجوور بوون «هەژار، پێنج ئەنگوست»› 🇮🇷 همواره

**دایمە / dayme/**: ئاوەڵکار. هەمیشە 🇮🇷 همیشه

▣ **دایمەی خوا**: ☜ **دایم‌ودەرهەم**

**دایمەودەرهەم**: ☜ **دایم‌ودەرهەم**

**دایمەسۆناتێ / daymesonatî/**: ناو. کایەیێکە 🇮🇷 از بازی‌ها

**دایمەمەست / daymemest/**: ئاوەڵناو. هەمیشە مەست 🇮🇷 دائم‌الخمر

**دایمی / daymî/**: ئاوەڵناو. هەمیشەیی ‹شوێنی دایمی ئێرەیە› 🇮🇷 دایمی

**داین[1] / dayin/**: چاوگ. دان 🇮🇷 دادن

**داین[2]**: ☜ **دایەن**

**دایناسۆر / daynasor/**: ناو. دەستەیەک لە گیاندارانی زەبەلاحی سەردەمی میزۆزوییک کە لە کۆتایی دەورانی کرتاسەدا کۆتاییان پێ هات 🇮🇷 دایناسور

**داینەدە / dayinde/**: ئاوەڵناو. دلاوا؛ دەهەندە 🇮🇷 بخشنده

**داینە / dayne/**: ☜ **داوێن**

**دایە / daye/**: ناو. ۱. دایک ۲. تایەن ۳. سەرناوی لەگەڵ رێزدا، بۆ ژنی ساڵ بەسەردا چوو 🇮🇷 ۱. مادر ۲. دایه ۳. عنوان احترام‌آمیز برای زنان سالخورده

**دایەحەوا / dayeĥewa/**: ناو. دایکەوا؛ حەووا؛ مەشینە؛ ژنی بابەدەم؛ یەکەم ژنی ئافرێنراو لە ئامۆژە دینییەکاندا 🇮🇷 حوا؛ همسر آدم

**دایەخ / dayex/**: ناو. دایەق؛ کەڵک؛ بەهرە؛ فایدە 🇮🇷 بهره

**دایەخانم / dayexanim/**: ☜ **دایەگەورە**

**دایەق / dayeq/**: ☜ **دایەخ**

**دایەگەورە / dayegewre/**: ناو. نەنک؛ نەنە؛ داپیرە؛ ددا؛ دایەخانم 🇮🇷 مادربزرگ

**دایەلێ / dayelê/**: ☜ **دایکەلێ**

**دایەڵکە / dayełke/**: ناو. ئامرازێکە لە ئاسیاودا 🇮🇷 ابزاری در آسیاب

**دایەمەمدەبەگورگێ / dayememdebegurgê/**: ناو. یارییەکی منداڵانەیە 🇮🇷 از بازی‌های کودکانه

**دایەن / dayen/**: ناو. دایان؛ تایەن؛ دادۆک؛ دادی؛ دایین؛ داین؛ ئادی؛ لەلەی ژن؛ ئەو ژنەی بە مووچە شیر ئەدا بە منداڵی خەڵک ‹دایەن لە حاڵی منداڵ بەلەدە «مەسەل»› 🇮🇷 دایه

**دایەنگا / dayenga/**: ناو. شوێنی پەروەردە کردنی منالی ساوا 🇮🇷 پرورشگاه

**دایەنی[1] / dayenî/**: ناو. دایانی؛ کاری شیر دان بە منالی خەڵک 🇮🇷 دایگی

**دایەنی[2]**: ئاوەڵناو. دایانی؛ تایبەتمەندی منداڵێ کە دراوەتە دەستی دایەن لە ماڵی خۆیدا گەورەی بکا 🇮🇷 ویژگی و حالت کودکی کە در خانەی دایه بزرگ می‌شود

**دایی / dayî/**: ناو. دۆک؛ شۆکە 🇮🇷 سپیدک گیاهی

**داییسان / dayîsan/**: ☜ **دایسان**

**داییساو / dayîsaw/**: ئاوەڵناو. رۆشن؛ هەڵکراو 🇮🇷 افروخته

**دایین / dayîn/**: ☜ **دایەن**

**دبدب[1] / dibdib/**: ناو. دبدۆب: پاسەوان؛ ئێشک‌گر 🇮🇷 نگهبان

**دبدب[2]**: دەنگ. ۱. دبێدبێ؛ وشەیەکە شوان ئاژەڵی

پێ بانگ دەکا ٢. وشەیێ کە شیردۆش لە کاتی شیر دۆشیندا بۆ ئاژەڵ، بەتایبەت مانگای دەخوێنێ ☰ ١. صوتی کە شبان گلەاش را با آن می‌خواند ٢. واژەی شیردوش با حیوانی کە می‌دوشد

**دبدۆب** / dibdob/: ☜ **دبدب**[1]

**دبێدبێ** / d(i)bêd(i)bê/: ☜ **دبدب**[2]

**دپل** / dipl/: ناو. تبل؛ قامک؛ تلی؛ ئەنگووس؛ ئەنگوست ☰ انگشت

**دت** / dit/: ☜ **دوت**

**دتەر** / diter/: ناو. لاسایی؛ دەمەلاسکە ☰ تقلید؛ ادا

**دچ** / diç/: ناو. ١. سووچ؛ قوژبنی دیوار ٢. ددانە ☰ ١. نبش دیوار ٢. دندانە

**دخلەدان** / dixledan/: ☜ **دەغڵ**

**ددا** / dida/: ☜ **دایەگەورە**

**ددان** / didan/: ناو. دنان؛ دگان؛ دیان؛ دران؛ دزان؛ دندان؛ دان؛ دنوو؛ هەر یەکە لە ئەندامانی سپی و ڕەقی نێو زار کە لە سەر شەویلکەی مۆرەغەدارانەوە دەڕوێن و بۆ جوین و داکرۆژتنی خۆراک یان وەک ئامێری بەرەنگاری بە کەڵک دێن ‹ددان ئێشان، چارەی کێشان! «مەسەل»› ☰ دندان

▣ **ددانی حەوت ساڵە**: ☜ **ددانی شیری**

**ددانی دەسکرد**: دنودەرکی؛ دنوون دەشەکی؛ دنان عاریە؛ ددانێ کە ددانساز چێی دەکا و لە جێی ددانە نەماوەکان دادەنرێن ☰ دندان مصنوعی

**ددانی شیری**: ددانی حەوت ساڵە؛ هەرکام لەو ٢٠ ددانە لە زاری منداڵانی شیرەخۆرەدا کە لە دوای شەش مانگییەوە تا دوو ساڵان دەردێن و لە دەور و بەری حەوت ساڵەییدا دەکەون ☰ دندان شیری

**ددانی عەقڵ**: ئاخر ددانی هەردوو لای شەویلکەی مرۆڤ کە دوای هەژدە ساڵان دەردێن و جاروبارەش هەر دەرنایەن ☰ دندان عقل

**ددانی کرمۆڵ**: ددانی قرۆڵ/خوراو/ پواوە ☰ دندان کرم خوردە

▣ **ددان ئاڵ بوونەوە**: دان ئاڵ بوونەوە؛ دیان هاڵ بوونەوە: ١. ددان بە شتی ترش کول بوون ٢. هەلزرنگانی دەماری بنی ددان بە دەنگێکی تایبەت وەک کیڕانی دوو شت بە یەکتردا و ... ☰ ١. کُند شدن دندان از تماس با ترشی ٢. تحریک عصب دندان با صدای موذی

**ددان بە جەرگدا گرتن/ نان**: ☜ **ددان بە (جەرگی) خۆدا گرتن**

**ددان بە (جەرگی) خۆدا گرتن**: ددان بە جەرگدا گرتن/ نان؛ دەرهەڵ نەبوون؛ لە پڕ هەڵنەچوون؛ پشوودرێژ بوون ‹نە ددان بە جەرگی خۆدا گرتن و نە دەرنەبڕینی ئێش و ئازار و نە هاوار و داد و بێداد لە دەسی ژان، تا ئێستا هیچ دەردێکیان دەرمان نەکردووە... «زەبیحی»› ☰ دندان روی جگر گذاشتن

**ددان پێدانان**: ١. */مەجاز/* پێ لێ نان؛ چوونە ژێر؛ ڕاستی مەبەستێ (زیاتر ناخۆش و پێچەوانەی بەرژەوەندی) ئاشکرا کردن ‹ئاخری ددانی پێدا نا کە کاری خۆی بووە› ٢. */کینایە/* جوان و دروست دەربڕینی وشە لە قسەکردندا ‹پەلە مەکە! باش ددانی پێدا بنێ با لێت حالی بین› ☰ ١. اعتراف کردن ٢. فصیح و واضح صحبت کردن

**ددان پڕ کردنەوە**: دیان پڕ کردن؛ چاکردنەوەی ددانی کرمۆڵ یان سەرکەل بە دەستی ددانبژیشک ☰ دندان پر کردن

**ددان تیژ کردنەوە**: */کینایە/* دان تیژ کردن؛ دیان لێ تیژ کردن؛ قورم خۆش کردن؛ مرخ خۆش کردن؛ تەماح کردن ☰ دندان تیز کردن

**ددان تێکردنەوە/ نان/ نیان**: ددانی دەسکرد نانە

جێ ددانی که‌وتوو ☰ دندان مصنوعی گذاشتن

**ددان جیڕ کردن:** دان/ ددان جیڕ کردنـه‌وه؛ ددان چیڕ کردن؛ دان/ ددان ڕیچ کردنه‌وه؛ ددان بـه گڕی شـاندان؛ دان لـه سـه‌ر یـه‌ک نـان و بـه گوشاری شاویلکه‌وه ده‌نگ لێیانه‌وه ده‌رهێنـان ☰ دندان بر هم فشردن

**ددان جیڕ کردنه‌وه:** ☜ **ددان جیڕ کردن**

**ددان چوونه کلێله:** دیان کلێلـه بـوون؛ ددان بـه سه‌ر یه‌کدا نووسان و زار هه‌ڵنه‌پچڕان ☰ دهان قفل شدن

**ددان چیڕ کردن:** ☜ **ددان جیڕ کردنه‌وه**

**ددان ده‌رهێنـان:** ددان ده‌رهـاوردن ☰ دنـدان درآوردن

**ددان ڕیچ کردنه‌وه:** ☜ **ددان جیڕ کردنه‌وه**

**ددان سپی بوونـه‌وه:** */کنایـه/* دان سـپی بوونـه‌وه؛ دیـان چـه‌رمگ بـوون؛ شـه‌رم و شـووره‌یی لا نه‌مان ☰ شرم و حیا رفتن

**ددان کرمۆڵ بـوون:** ددان پـوان ☰ دنـدان را کـرم خوردن

**ددان که‌وتن:** دیان کـه‌فتن؛ ددان لـه جـێ خـۆ ده‌رهاتن و به خه‌سار چوون ☰ دندان افتادن

**ددان کێشـان:** دیـان کێشـان؛ دان لـه جـێ خـۆ ده‌رهێنان ☰ دندان کسی را کشیدن

**ددان گرساندن:** چیڕ کردنـه‌وه‌ی ددان؛ هه‌ڕه‌شـه کردن به ددان شاندان ☰ چنگ و دنـدان نشـان دادن

**ددان لێک سپی بوونـه‌وه:** */کنایـه/* دیـان لـه یـه‌ک چه‌رمگ بوونـه‌وه؛ هـیچ لـه نێوانـدا نـه‌مان ☰ نماندن شرم و حیا در برابر هم

**ددانی خێر پێدا نـه‌هێنان:** */مـه‌جاز/* ددانی هـه‌ق پێدا نه‌هێنان؛ به چاکه باس نه‌کردن ☰ خوب از کسی یاد نکردن

**ددانی شتێ نه‌بوون:** ١. ددانی ساق بـۆ خـواردنی شتێ نه‌بوون ‹کوڕه‌که‌م! من ددانی بنکڕ خواردنم نییه› ٢. */کنایه/* له ڕاده‌ی ده‌سلاتی که‌سـێکدا نه‌بوون ‹کۆلکه‌مه‌لایـه‌ک ددانی خـواردنی پـاره‌ی وای نییه› ☰ ١. دندان چیزی را نداشتن ٢. در حـد و حدود کسی نبودن

**ددانی هه‌ق پێدا نه‌هێنان:** ☜ **ددانـی خێـر پێـدا نه‌هێنان**

**ددانـی بـه حـه‌وت سـاڵان ده‌رهێنـان:** */کنایـه/* زۆر چکووس و ده‌ستقووچاو بوون ☰ بسیار خسیس بودن

**گرتنه ددانه‌وه:** ١. به ددان ڕاگرتن ٢. */کنایه/* بـۆ هه‌موو شوێنێ له‌گه‌ڵ خۆ بردن و لێ نه‌بوونه‌وه ☰ ١. به دندان گرفتن ٢. همه جا با خود بُردن

**ددان‌ئێشه / didan'êşe/:** ناو. دۆخی ئێشـانی ددان به هۆی پواوی و ڕزاوییه‌وه ☰ دندان‌درد

**ددان‌پزیشـک / didanp(i)zîşk/:** نـاو. دانپزیشـک؛ دیـان‌پزیشـک؛ پزیشـکی تایبـه‌تی ددان ☰ دندانپزشک

**ددان‌پزیشکی / didanp(i)zîşkî/:** ناو. دانپزیشکی؛ دیـان‌پزشـکی: ١. زانسـت و پیشـه‌ی ناسـینی ئازاره‌کـانی ددان و شـه‌ویلاک و ده‌رمانیـان ٢. مه‌ته‌بی ددان‌پزیشک ☰ ١و٢. دندانپزشکی

**ددان‌خۆشک / didanxoşik/:** ناو. سپڵ ☰ طحال

**ددانـدن / didandin/:** چـاوگ. ١. شـات‌وشـووت کردن؛ خۆ هه‌ڵکێشـان ٢. درۆ کـردن ☰ ١. لاف زدن ٢. دروغ گفتن

**ددان‌ده‌ر‌په‌ڕیو / didanderpeřîw/:** ☜ **ددان‌گڕ**

**ددانسـاز / didansaz/:** نـاو. دانسـاز؛ دیانسـاز؛ وه‌سـتای دروسـت کـردنی ددانی ده‌سـکرد ☰ دندانساز

**ددان‌شکاو / didanş(i)kaw/:** ئاوه‌ڵناو. دان‌کـه‌ل ☰ دندان‌شکسته

**ددان‌که‌ل / didankel/:** ئاوه‌ڵناو. دان‌که‌ل؛ که‌لـه‌فیچ

☰ دندان‌شکسته

**ددان‌که‌وتوو / didankewtû/**: ئاوه‌ڵناو. که‌ڵخۆت؛ کۆلۆس؛ کۆلۆز ☰ بی‌دندان

**ددانگڕ / didangiř/**: ئاوه‌ڵناو. ددان‌گه‌وره؛ ددان‌ده‌رپه‌ڕیو ☰ دندان‌برجسته

**ددانگه‌وره / didangewre/**: ☞ ددانگڕ

**ددانوک / didanuk/**: ☞ ددانه ـ١

**ددانۆک / didanok/**: ☞ ددانه ـ١

**ددانه / didane/**: ناو. ١. ددانۆک؛ داڵبڕ؛ دیانه؛ دنانه؛ دن؛ دچ؛ ددانوک؛ دانه؛ چوکله؛ قارت؛ ده‌ن؛ هه‌رکام له قوتکه‌گه‌لی یه‌ک‌ڕیز و یه‌ک له دوای یه‌ک ٢. پارچه به‌رد، ئاجور یان شتی‌تر که بۆ ڕێک کردنی ڕزنی دیوار به کار دێ ٣. ئامرازێکی مه‌کینه‌ی به‌رگدرووه، پارچه‌که ڕاده‌دا ☰ ١. دندانه ٢. پُغاز ٣. پیش‌بر چرخ خیاطی

**ددانه‌چرۆقه / didaneç(i)roqe/**: ☞ دانه‌چۆقه

**ددانه‌چیڕه / didaneçîře/**: ☞ دنوڕیچه

**ددانه‌چیڕێ / didaneçîřê/**: ☞ دنوڕیچه

**ددانه‌دار[١] / didanedar/**: ناو. داڵبڕ ـ داڵبڕ؛ دیانه‌دار؛ به دیانه و داڵبڕگه‌لی تیژه‌وه له لێوار و که‌ناردا ☰ دندانه‌دار

**ددانه‌دار[٢]**: ئاوه‌ڵناو. شه‌نده‌لی؛ مشاره؛ به دیانه و داڵبڕی تیژه‌وه له لێوار و که‌ناردا ☰ دندانه‌دار

**ددانه‌ڕۆ / didanero/**: ☞ دانوله ـ١

**ددانه‌ڕێوی / didaneřêwî/**: ☞ دان‌ڕێوی

**ددانه‌کرۆژه / didanek(i)roje/**: ☞ دنوڕیچه

**ددۆ / d(i)do/**: ☞ ددوو

**ددوو / didû/**: ناو. ددۆ؛ دوو؛ یه‌ک و یه‌ک ☰ دو

**دراپێ / d(i)rapê/**: ناو. باریکه پارچه‌ی جوان و چیندار بۆ ڕازاندنه‌وه‌ی په‌رده، موبل یا ملیوانه‌ی جل‌وبه‌رگ ☰ دراپه

**دراخه / d(i)raxe/**: ناو. مه‌ڵۆی ده‌خڵ؛ ده‌سته‌یه‌کی بچووک له درووێنه ☰ یک دسته‌ی کوچک از درویده

**دراڤ / d(i)rav/**: ناو. ١. ☞ دراو[١]ـ١ ٢. درز و قه‌ڵشتی دیوار ٣. بالاف؛ شیووکوڵ ☰ ١. ☞ دراو[١]ـ١ ٢. درز و ترک دیوار ٣. رختشویی

**دراڤگه‌نی / d(i)ravgenî/**: ئاوه‌ڵناو. *[پلار]* پاره‌پیس؛ چنۆک؛ به‌رچاوته‌نگ ☰ خسیس

**درام / d(i)ram/**: ناو. شانۆ یا فیلمێ که باس له ڕووداوێکی خه‌ماوی یا پێکه‌نینی ده‌کا، بێ ئه‌وه‌ی شێوه‌ی تراژێدیا یان کۆمێدی بگرێ ☰ درام

**دراماتیک / d(i)ramatîk/**: ئاوه‌ڵناو. ١. سه‌ر به درام ٢. شانۆیی؛ شانۆکی؛ نومایشی ‹هونه‌رگه‌لی دراماتیک› ☰ ١و٢. دراماتیک

**دران[١] / d(i)ran/**: چاوگ. تێنه‌په‌ر. نادیار. //درای؛ ده‌درێ؛ بدرێ// دریان: ١. شتێ به که‌سێ گه‌یشتن ‹پیاو ئه‌بێ بۆ سه‌ندنی هه‌ققی له مردن سڵ نه‌کا/ هه‌ر «برووخێ» به‌س نییه، تاکوو نه‌سه‌ندرێ، نادرێ «بێکه‌س»› ٢. شتێ به که‌سێ به‌خشران ٣. به‌رپرسایه‌تی شتێ که‌وتنه ژێر ده‌ستی که‌سێ ☰ ١. داده شدن ٢. بخشیده شدن ٣. واگذار شدن

■ ئاوه‌ڵناوی به‌رکاری: دراو/ چاوگی نه‌رێنی: نه‌دران

**دران[٢]**: ☞ ددان

**دراو[١] / d(i)raw/**: ناو. ١. دراڤ؛ دریڤ؛ پاره؛ پوول ٢. ده‌یتا؛ زانیاری ڕاسته‌قینه و به‌کار (وه‌ک ئه‌ندازه یان ژمێرکۆ) له هه‌ر شتێک که ده‌بێته بنه‌مای بۆچوون، لێکۆڵینه‌وه یان هه‌ژماردن ☰ ١. پول ٢. داده

**دراو[٢]**: ئاوه‌ڵناو. پێ‌دراو؛ به‌خشراو ‹پاره‌ی دراو› ☰ داده شده؛ اعطا شده

**دراو[٣]**: پاشه‌وشه. پێ‌دراو ‹ڕێدراو› ☰ داده

**دراوسێ / d(i)rawsê/**: ناو. ده‌راوسا؛ هاوسادرگا؛ جیرانی ماڵ به ماڵ ☰ همسایه‌ی دیوار به دیوار

**دراوسێ‌وه‌زن / d(i)rawsêwezin/**: ئاوه‌ڵناو. هاوساڕه‌نجێن؛ خراپ ده‌گه‌ڵ هاوسایان ☰

همسایه‌آزار

**دراوگۆڕەوە** / d(i)rwgořewe/: ناو. گۆهێڕ ☰ صرّاف

**دراوێر** / d(i)rawêr/: ناو. مەجەڕ؛ جۆرێ کومێد بە چەن کەشاوەوە ☰ دراور

**درایڤ** / d(i)rayv/: ناو. بەشێک لە کۆمپیوتەر کە دیسکی تێ دەخەن ☰ درایو

**درایڤێر** / d(i)rayvêr/: ناو. فایلی ڕێخەری پاژەکانی کەمپیوتەر ‹درایڤێری کارتی گرافیکی› ☰ درایور

**درباشە** / dirbaşe/: ناو. زەرگ؛ شیشی دەرویشان ☰ سیخ دراویش

**دربۆ** / dirbo/: دەنگ. درچە؛ وشەی دنەدانی بەران بۆ شەڕەقۆچ ☰ واژەی تشجیع قوچ به مبارزه

**درتاڵ** / dirtał/: ناو. چاڵوچۆڵ؛ کەندولەند ☰ چاله‌چوله

**درچە** / dirçe/: ☜ **دربۆ**

**درخت** / d(i)rixt/: ☜ **درەخت**

**درخە** / dirxe/: ناو. ☜ **درگە**

**دردوک** / dirduk/: ئاوەڵناو. بێ‌تام‌وێژ؛ قسەی بێ مانا بێژ ☰ ژاژخا

**درز** / dirz/: ناو. دەرز: ١. چاک؛ بِلیش؛ قەڵشتی بچووک ‹درزی شیشە و ئاوێنە› ٢. قەڵش؛ قلیش؛ قەڵەش؛ ترەک؛ ترەکە؛ تریشکە؛ کەلێن؛ تریک؛ چاک ‹لە درزی درگاکەوە بڕوانە!› ٣. *[پزشکی]* شوێنی پێکەوە لکانی ئێسکەکانی کاپۆڵ (سەر) ☰ ١تا٣. درز

▣ **درز بردن**: درز تێ کەوتن؛ قەڵشان ‹ئاوێنەکە درزی برد› ☰ ترک بردن

**درز تێکەوتن**: ☜ **درز بردن**

**درز دادان**: قەڵشتە دیوار بە قوڕ گرتن ☰ درزگیری کردن

**درز گرتن**: کەلێن گرتن ☰ درز گرفتن

**درزبردوو** / dirzbirdû/: ئاوەڵناو. قلیشاو؛ درزتێ‌کەوتوو ☰ تَرک برداشته

**درژ** / dirj/: ئاوەڵناو. ١. خاو؛ بانەدراو ٢. تووڕە؛ گرژ ٣. لێک‌هاڵاو؛ مات و کروشمە کردوو ☰ ١. تاب‌نخورده ٢. خشمگین ٣. درهم‌رفته

**درژانگ** / dirjang/: ئاوەڵناو. لاواز ☰ لاغر

**درسەگ** / dirseg/: ناو. سنوور؛ جەسپەر ☰ مرز

**درشت** / d(i)rişt/: ئاوەڵناو. ١. زبر؛ زوور ٢. زل؛ دورشت ‹یەکسەر عولەما درشت و وردی/ ناخوێننەوە دوو حەرفی کوردی «حاجی قادر»› ☰ ١. زبر؛ خشن ٢. دُرُشت

**درشتی** / dirişti/: ناو. زلی؛ گردی؛ گەورەیی ☰ درشتی

**درغە** / dirğe/: ☜ **درگە**

**درف** / dirf/: ناو. نیشانە؛ ئارم ☰ نشان؛ آرم

**درڤ** / dirv/: ناو. ڕەگەز؛ بنیچە ☰ اصل

**درقە** / dirqe/: دەنگ. قرتە؛ دەنگی قرتان ☰ صدای قطع شدن چیزی

**درقەدرق** / dirqedirq/: دەنگ. کرتەکرت (مشک‌ئاسا) ☰ صدای خاییدن

**درکان**[١] / dirkan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //درکای؛ دەدرکێی؛ بدرکێ// بە زماندا هاتن؛ قسە دەرچوون ☰ فاش شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: درکاو/ چاوگی نەرێنی: نەدرکان

**درکان**[٢]: ناو. لاراو؛ دژاو؛ زەوینی نابار و لێژ ☰ زمین ناهموار

**درکاندن** / dirkandin/: چاوگ. تێپەڕ. //درکاندت؛ دەدرکێنی؛ بدرکێنە// درکانن: ١. دەرخستنی ڕاستی بە قسە، چاو و... ‹سوێندت بۆ دەخۆم هەتا بمێنم/ ئەو ڕازە لە کن کەس نەدرکێنم «هێمن»› ٢. دان پێدا نان؛ موکوڕی کردن ‹لە ئاکامدا درکاندی کاری خۆی بووە› ☰ ١. فاش کردن ٢. اعتراف کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەدرکاندن

**درکانن / dirkanin/:** ☜ **درکاندن**

**درکە / dirke/:** ناو. سۆسە؛ سووسە؛ کاری گوتنی بەشێک لە نهێنی ☰ عمل فاش کردن بخشی از اسرار

**درگا / dirga/:** ناو. دەرگا؛ دەرک؛ دەرکە؛ دریا؛ دەرانە؛ بەرە: ١. کەرەسەیەک کە ڕێگەی چوونە ناو یان هاتنە دەرەوەی جێگایەکە و دەکرێتەوە و پێوە دەدرێ ‹درگای ماڵ› ٢. سەر؛ زاربێن؛ دەرگابێن؛ دەرخون؛ دەرخۆنە؛ دەرخووین؛ پەڕەیەک بۆ سەر نانەوەی دەفر ‹درگای قابلەمە› ٣.*[مەجاز]* چەمک یان ڕێگای گەیشتن بە شتێ یان جێیەک ‹درگای ئاشتی؛ درگای وتووێژ› ☰ ١تا٣. در

▣ **درگا بون:** ☜ **درگا کردن**

**درگا پێگرتن:** چوونە بەر درگای ماڵی کەسێک بۆ داخوازێک ‹قەرزدار درگایان پێ گرتبوو› ☰ درِ خانەی کسی را گرفتن

**درگا دان:** ئاواڵە کردنەوە ☰ باز کردن دهانە

**درگا کردن:** درگا بوون؛ ئاواڵە بوونەوەی دەمی برین ☰ باز شدن سر زخم

**درگا گرتنە کوڵەوە:** ☜ **درگا لە ڕێسمە هێتان**

**درگا لە ڕێسمە هێنان/ دەرهێنان:** *[کینایە]* درگا گرتنە کوڵەوە؛ هەراس پێ هەڵگرتن ‹داواکار درگایان لە ڕێسمە هێنابوو› ☰ پاشنەی در را از جا درآوردن

**درگا لە سەر خۆ داخستن:** *[کینایە]* لە ماڵەوە دانیشتن و لەگەڵ کەس نەدوان و هەڵس‌وکەوت نەکردن ☰ در به روی خود بستن

**درگا لە سەر کەسێ داخستن:** لە دیتنی کەسێ دووری کردن ☰ در به روی کسی بستن

**درگا لە کەسێک کرانەوە:** *[کینایە]* ڕێگەچارە بۆ کێشە و گرفتی کەسێ پەیدا بوون ☰ در به روی کسی باز شدن

**درگای شوێنێ گرتنە هەرگ:** ☜ **درگای شوێنێ لە قوڕ گرتن**

**درگای شوێنێ لە قوڕ گرتن:** *[کینایە]* درگای شوێنێ گرتنە هەرگ؛ شوێنێ لەبەر کارلێ‌نەهاتوویی داخستن ☰ در جایی را گل گرفتن

**لە درگا دان:** دان لە درگا؛ درگا لێدان بۆ چوونە ژوورەوە ☰ در زدن

**هەموو درگایەک کوتان:** *[کینایە]* بۆ لای هەموو جۆرە خەڵک و جێگای جۆراوجۆ (بۆ گەیشتن بە مەبەست) چوون ☰ به هر دری زدن

**درگاژەن / dirgajen/:** ناو. ١. کەسێ کە لە دەرکە دەدا ٢. درگاژەنە؛ ئاسنێ کە پێی لە دەرکە دەدەن ☰ ١. درکوب ٢. درکوبه

**درگاژەنانە / dirgajenane/:** ناو. کاری شیرنی دان بە هۆی کەوتنەکاری دام و دەزگایەک ☰ افتتاحیه

**درگاژەنە / dirgajene/:** ☜ **درگاژەن-٢**

**درگان / dirgan/:** ناو. شەنە ☰ چارشاخ

**درگانە / dirgane/:** ناو. دریانە؛ دەرکە؛ دەری ☰ درگاه

▣ **درگانەی ڕەحمەت:** ☜ **دەرگانەی ڕەحمەت**

**درگاوان / dirgawan/:** ☜ **دەرکەوان**

**درگاوبان / dirgawban/:** ☜ **دەرکوبان**

**درگە / dirge/:** ناو. درخە؛ مژاد؛ سووژە؛ کاربەند؛ مەبەستی لێ‌دوان و لەسەر نووسین ☰ سوژه

**درگەنە / dirgene/:** ئاوەڵناو. لاسار؛ کەللەڕەق ☰ لجباز

**درم[1] / dirm/:** ناو. ١. پەتا؛ ئاهۆ؛ نەلامەت ٢. سەرماخوردەیی ☰ ١. مرض واگیر ٢. سرماخوردگی

**درم[2]:** دەنگەناو. گرمەی دەهۆڵ ☰ صدای طبل

**درماز / dirmaz/:** ناو. بەرانی پێنج ساڵان ☰ قوچ پنج ساله

**درمغ / dirmiğ/:** ناو. شانە بۆ کۆ کردنەوەی کڵۆش

▀ شن‌کش مانندی برای جمع کردن ساقه‌ی غله

**درمناسی** / dirmnasî/: ناو. پەتاناسی ▀ آفت‌شناسی

**درمە** / dirme/: ناو. درنە؛ کرمێکە لە زگی ئاژەڵدا پەیدا دەبێ ▀ کرمی انگل دام

**درمەغ** / dirmeğ/: ناو. چنگانە؛ گوڵکێش ▀ چنگک علف

**درمەنە** / dirmene/: ناو. برینجداس؛ بەرزەڵەنگ ▀ درمنە

**درنج** / d(i)rinc/: پێرۆ. ← **دێو و درنج**

**درنگانەوە** / d(i)ringanewe/: ☜ **زرینگانەوە ـ١**

**درنگە** / d(i)ringe/: دەنگەناو. زرینگ؛ زرنگە ▀ جرینگ

**درنە** / dirne/: ☜ **درمە**

**دروان** / dirwan/: چاوگ. ١. دووریان ٢. ڕنیان؛ دروێنە کران ‹تا بە داسی دەسی ئەو پاڵە بەکارەی کوردی/ درک و داڵی سەرەڕێ گشتی نەدروێن دەگریم «هێمن»› ▀ ١. دوختە شدن ٢. درو شدن

**دروانـدن** / dirwandin/: چاوگ. تێپەڕ. //دروانـدت؛ دەدروێنی؛ بدروێنە// دروێنە کردن ▀ درو کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەدرواندن

**دروانەوە** / dirwanewe/: چاوگ. ١. دوورینەوە؛ دیسان دوورین ٢. ڕنینەوە ▀ ١. بازدوختن ٢. درو کردن

**دروس** / d(i)rus/: ☜ **دروست**

**دروست**[1] / d(i)rust/: ئاوەڵناو. درووس؛ دروس؛ دورست: ١. ڕاست؛ ڕەوا ‹قسەی دروست› ٢. ساز؛ بێ‌کەمایەسی ‹وەستا کاری دروستە› ٣. جۆر؛ ئامادە ‹کارەکەت دروست بوو؟› ▀ ١. درست ٢. کامل؛ بدون نقص ٣. درست

⊡ **دروست بون:** درووس بوون: ١. ساز بوون ٢. جۆر بوون ٣. دروستکار بوون ٤. [کینایە] خەوتنی ژن و مێرد پێکەوە ▀ ١. مُهیا شدن ٢. درست شدن ٣. درستکار بودن ۴. با هم خوابیدن زن و شوهر

**دروست کردن:** درووس کردن؛ ساز دان: ١. وەدیهێنان ‹ماڵ دروست کردن› ٢. جۆر کردن ‹ئەم کارەم بۆ دروست کە!› ▀ ١و٢. درست کردن

**دروست کردنەوە:** ١. چاک کردنەوە ‹ڕادیۆکەم بۆ دروست کەوە!› ٢. دیسانەوە دروست کردن ▀ ١. تعمیر کردن ٢. دوبارە ساختن

**دروست**[2]: ئاوەڵکار. درووس؛ دروس؛ دورست؛ ڕێک؛ بە دروستی ‹ئارامیش دروست ئەو کارەی کرد کە پێمان وتبوو› ▀ درست

**دروستکار** / d(i)rustkar/: ئاوەڵناو. درووسکار؛ ڕاستکار؛ ئاقدەست؛ ئاز؛ جەمتانە؛ کاردرووس؛ دەسپاک؛ بەختەوار؛ ڕاست و دروست؛ بێ‌فڕوفێڵ؛ تایبەتمەندی مرۆی بێ‌لاری و خواری و بێ‌گزی و فزی. هەروەها: **دروستکاری** ▀ درستکار

**دروستکراو** / d(i)rustk(i)raw/: ئاوەڵناو. درووسکراو؛ سازکراو ▀ ساختە

**دروستکەرەوە** / d(i)rustkerewe/: ناو. ڕەژێدەر ▀ تعمیرکار

**دروستی** / d(i)rustî/: ناو. درووسی؛ ڕاستی ▀ راستی

**دروشم** / d(i)ruşm/: ناو. ١. بیچم؛ کەسم؛ سەروسیما ٢. ڕۆشنی ٣. ☜ **درۆشم** ▀ ١. شمایل ٢. فروغ ٣. ☜ **درۆشم**

**دروین** / dirwîn/: چاوگ. ١. دوورین (بە دەرزی و بەن) ٢. دروێنە کردن (بە داس و ...) ▀ ١. دوختن ٢. درویدن

**دروێن** / dirwên/: ☜ **دروێنە**

**دروێنە** / dirwêne/: ناو. دروێن؛ درەو؛ درێنە؛ دروونە؛ کار و ڕەوتی برینەوەی دەغڵ و ڕووەکی کێڵگە و دەشت ▀ درو

**دروێنەکراو** / dirwênek(i)raw/: ☜ **دوراو ـ١**

**دروێنەوان** / dirwênewan/: ناو. درەوان؛ پاڵە؛

درەوکەر؛ ناندروو؛ ئەوەی دروێنە دەکا ☗ دروگر

**درۆ** / d(i)ro/: نـاو. درووِ؛ درەو؛ درەو؛ قــڕ؛ درێ؛ دەرەو؛ فیشاڵ؛ ئاخلێف؛ قەوانە؛ هـەلات؛ پـۆت؛ قسـەی هەڵبەستە و ناڕاست کە بە مەبەستی فریودان یـا شوێنەگومکێ دەگوترێ ‹درۆ لـە غـەریبی، تـڕ لـە بیابان! «مەسەل»› ☗ دروغ

⊡ **درۆی تاشراو:** *[مەجاز]* درۆی وەک ڕاست؛ درۆیەک کە وەستایانە سازکرابێ ☗ دروغ دستەنقاشی

**درۆی مەسڵەحەتی:** درۆیەک کە بۆ کوژاندنـەوەی بشێوە و وەیشوومە و بەرگری لە گەزن و زیـان دەگوترێ ☗ دروغ مصلحتی

⊡ **درۆ تاشین:** *[مەجاز]* درۆ نانەوە؛ درۆ هەڵبەستن؛ دروست کردنی درۆ ☗ دروغ تراشیدن

**درۆ داخستن:** *[مەجاز]* بلاو کردنەوەی قسە و باسی درۆ ☗ دروغ پراکندن

**درۆ دان:** ☜ **درۆ کردن**

**درۆ کردن:** درۆ دان؛ ددانـدن؛ درۆ وتـن؛ بـەن برین؛ فشە کردن ☗ دروغ گفتن

**درۆ نانەوە:** ☜ **درۆ تاشین**

**درۆ هەڵبەستن:** ☜ **درۆ تاشین**

**بە درۆ خستنەوە:** خستنە درۆوە؛ ڕوون کردنەوەی درۆی کەسێک کە پێشتر هەڵیبەستووە ‹لەوەی کە بە درۆم خستەوە، دڵـگیر بـوو› ☗ دروغ آشـکار کردن

**بە درۆ دەرچوون:** ڕاسـت نـەبوون؛ دەرکـەوتنی ناڕاست بوونی شت، ڕووداو یان هەواڵێک ‹ئـەم خەبەرەش بە درۆ دەرچوو› ☗ دروغ از آب درآمدن

**بە درۆ دەرکردن:** بە درۆ زانین؛ بڕوا پێ نـەکردن ☗ دروغ دانستن

**بە درۆ زانین:** ☜ **بە درۆ دەرکردن**

**خستنە درۆوە:** ☜ **بە درۆ خستنەوە**

**کەوتنە درۆوە:** ☜ **وە درۆ کەوتن**

**وە درۆ کـەوتن:** کەوتنـە درۆوە؛ درۆی کەسـێ ئاشکرا بوون ☗ دروغ آشکار شدن

**درۆباز** / d(i)robaz/: ☜ **درۆزن**

**درۆبازی** / d(i)robazî/: ☜ **درۆزنی**

**درۆپ** / d(i)rop/: ☜ **دڵۆپ**

**درۆپە** / d(i)rope/: ☜ **دڵۆپ**

**درۆخنای** / d(i)roxnay/: چـاوگ. هێنانە خارشت و کزە ☗ بە خارش آوردن

**درۆخیـای** / d(i)roxyay/: چاوگ. هاتنە خارشـت و کزە ☗ بە خارش آمدن

**درۆ(و)دەلەسە** / d(i)ro(w)delese/: نـاو. قســە و باسی درۆ ‹هەرگیز گوێ بە درۆودەلەسەی خەڵـکی دەمبەتاڵ مەدە!› ☗ دروغ ـ دونگ

**درۆزل** / d(i)rozil/: ئاوەڵناو. تۆپچی؛ هووشەبـاز ☗ دروغگو؛ لافزن

**درۆزن** / d(i)rozin/: ئاوەڵـناو. درۆبـاز؛ درۆکــەر؛ درەوکەر؛ درۆزە؛ دەرەویـن؛ دەرەوێـرە؛ قـڕۆکەر؛ هۆفاڵ؛ کەلاج؛ فیشاڵباز؛ فشەکەر؛ ڕاستنەبێژ ☗ دروغگو

**درۆزنە**[1] / d(i)rozne/: ناو. ۱. ئـێش و ئـازارێ کـە دێـت و دەڕوا ۲. سـەرەتای هێڵـی ناوەڕاسـتی سمت ‹شـالوارێکی پۆشـیبوو، دادەنـەوی درۆزنـەی قنگی دیار بووا› ☗ ۱. درد و آزاری کە پایـدار نیسـت ۲. ابتدای خط وسط باسن

**درۆزنە**[2]: ئاوەڵناو. تایبەتمەنـدی ئـاوێ کـە هـاوین وشک دەکـا ‹هانـە درۆزنـە› ☗ ویژگـی چشـمەی فصلی

ـ **درۆزنە**[3]: پاشەوشە. ناڕاست؛ درۆیـی ‹دایکەدرۆزنـە؛ شەکرەدرۆزنە› ☗ کاذب

**درۆزنی** / d(i)roz(i)nî/: ناو. درۆبازی؛ فیشاڵـبازی ☗ دروغگویی

**درۆزە** / d(i)roze/: ☜ **درۆزن**

**درۆسـازی** / d(i)rosazî/: نــاو. درۆزنی؛ کــاری هەڵبەســتن و ئامــادە کــردنی قســەی درۆ ☗

دورغسازی

**دروسای** / d(i)rosay/: چاوگ. ڕوان ☰ روییدن

**دروست** / d(i)rost/: ئاوەڵکار. بێ‌سۆ؛ بێ‌گومان؛ بێ‌شک؛ بە دڵنیاییەوە ☰ بی‌گمان

**دروسنای** / d(i)rosnay/: چاوگ. ڕوانـدن ☰ رویانیدن

**دروسیای** / d(i)rosyay/: چاوگ. ڕوان ☰ روییدن

**دروش** / d(i)roş/: ☜ **درەوش-۱**

**دروشم** / d(i)roşm/: ناو. دروشم؛ نیشانەی تایبەتی ☰ آرم

**دروشملێدراو** / d(i)roşmlêd(i)raw/: ناو. نیشانکرد؛ نیشان‌کراو ☰ علامت‌گذاری شده

**دروشن** / d(i)roşin/: ئاوەڵناو. بریقەدەر؛ بەدرەوشین ☰ درخشان

**دروشنای** / d(i)roşnay/: ☜ **درەوشاندن**

**دروشە** / d(i)roşe/: ناو. ۱. وشە؛ وتە ۲. داروبار ۳. درم؛ پەتا؛ ئاهۆ ٤. بریقە؛ درەوشە ٥. لوولاک ☰ ۱. کلمه ۲. تندرستی ۳. بیماری واگیر ۴. درخشش ۵. استخوان ساق

**دروشیان** / d(i)roşyan/: ☜ **درەوشان**

**دروشیای** / d(i)roşyay/: چاوگ. درەوشـای؛ درەوشان ☰ درخشیدن

**دروشین** / diroşîn/: ☜ **درەوشان**

**دروشێ** / d(i)roşê/: ناو. ئێسکی بەلەک تا سەر گوێزنگ ☰ استخوان ساق تا قوزک

**دروکامین** / d(i)rokamîn/: ☜ **دروین**

**دروکەر** / d(i)roker/: ☜ **دروزن**

**دروهەڵبەست** / d(i)roheɫbest/: ناو. ساختەکار؛ فیشاڵباز ☰ دروغگو

**درویی** / d(i)royî/: ئاوەڵناو. ۱. خەیاڵی؛ ناکردنی؛ نەشود ۲. ساختە؛ هەڵبەستراو ☰ ۱. خیالی ۲. جعلی؛ ساختگی

**دروین** / d(i)royîn/: ئاوەڵناو. درویی؛ دروکامین؛ دروینە؛ بەدەڵ ☰ دروغین؛ بدلی

**دروینە** / d(i)royîne/: ☜ **دروین**

**درو**[1] / d(i)rû/: ☜ **درۆ**

- **درو**[2]: پاشەوشە. ـ دوور: ۱. دۆزەر ‹بەرگدروو› ۲. درەوکراو ‹دەستدروو› ☰ ۱. ـ دوز ۲. درو شده

**دروب** / d(i)rûb/: ناو. درووف؛ وێکچوویی؛ وەکیەکی ☰ شباهت

**دروباندن** / d(i)rûbandin/: چاوگ. شباندن؛ وێچواندن؛ وەک ئەو زانین ☰ تشبیه کردن

**دروخان** / d(i)rûxan/: چاوگ. درووخیان: ۱. خورانی گەروو ۲. بەر بوونی مێرووی وەک زەردەواڵە ☰ ۱. خاریدن گلو ۲. هجوم آوردن حشرات مانند زنبور

**دروخاندن** / d(i)rûxandin/: چاوگ. درووخانن؛ بەردان و هان دانی مێرووی وەک زەردەواڵە ☰ چوب در لانەی زنبور کردن

**دروخانن** / d(i)rûxanin/: ☜ **دروخاندن**

**دروخە** / d(i)rûxe/: ناو. خورووی لەش ☰ خارش

**دروخیان** / d(i)rûxyan/: ☜ **دروخان**

**درود** / d(i)rûd/: ناو. سەڵوات ☰ صلوات

**دروس** / d(i)rûs/: ☜ **دروست**

⊡ **دروس بون**: ☜ **دروست بون**

**دروس کردن**: ☜ **دروست کردن**

**دروسکار** / d(i)rûskar/: ☜ **دروستکار**

**دروسکراو** / d(i)rûsk(i)raw/: ☜ **دروستکراو**

**دروسکەردە** / d(i)rûskerde/: ئاوەڵناو. دروستکراو؛ سازدراو ☰ ساخته

**دروسی** / d(i)rûsî/: ☜ **دروستی**

**دروشە** / d(i)rûşe/: ناو. ۱. دار؛ درەخت ۲. وەبا؛ چاوقوولکە ☰ ۱. درخت ۲. وبا

**دروڤ** / d(i)rûv/: ☜ **دروب**

**درولە** / d(i)rûle/: ناو. مەشکۆڵە؛ دۆدانە؛ دوانە ☰ مَشک کوچک دوغ

**دروومان** / d(i)rûman/: ناو. دوورمان؛ کار و ڕەوتی جل دروون؛ دوورین ☰ دوختودوز

**دروومانکار** / d(i)rûmankar/: ناو. بەرگدروو؛ بەرگدوور؛ جلدروو؛ خەیات ☰ خیاط

**دروون** / d(i)rûn/: چاوگ. تێپەڕ. //درووت؛ دەدرووی؛ بدروو// دوورین: ۱. تەقەڵ لە شت دان ‹تەمای وەیانە ڕاپەڕن، ببزوون/ لێوی دوژمنی هەرزەگۆ بدروون «هێمن»› ۲. دروانەدن؛ دروێنە کردن ‹کورد گیایەکە هەر چەندی بیدروون/ هەڵدەداتەوە دیسان هەڵەسوون «هێمن»› ☰ ۱. دوختن ۲. درو کردن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەدروون

**دروونای** / d(i)rûnay/: چاوگ. دروانەدن ☰ درو کردن

**دروونە** / d(i)rûne/: ☚ **دروێنە**

**دروونەوە** / d(i)rûnewe/: چاوگ. تێپەڕ. //درووتەوە؛ دەدروویەوە؛ بدرووەوە// دوورانەوە؛ دوورینەوە: ۱. دروێنە کردن؛ چنین بە داس ۲. پێکەوەنانی شتی دڕاو بە تەقەڵ ‹چاکی سینەم بۆچی ئەو خەیباتە نایدروێتەوە/ چاوی بیماری وجوودی کردمە دەرزی و دەزی «حاجی قادر»› ☰ ۱. درویدن با داس ۲. بازدوختن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەدروونەوە

**درووپای** / d(i)rûyay/: چاوگ. دروان ☰ درو شدن

**درە** / d(i)re/: ناو. هەرک؛ ئەو دەغڵەی کە بۆ تۆوی جیا دەکەنەوە ☰ غلّەی ویژەی بذر

**درەخت** / dirext/: ناو. دار؛ درخت؛ درووشە؛ قەنا؛ ڕوەکی هەمیشەیی لە چێو، بە لانی کەم شەش میتر بەرزی و لقوپۆی چەترئاسا لە سەریەوە ☰ درخت

**درەخت و دەوەن** / dirext û dewen/: ناو. دار و دەوەن؛ بێشە و دارستان (زۆرتر چڕ) ‹بۆنی درەخت و دەوەنی ناو کێو/ تازەی کردەوە نیو گیانی سەر لێو «گۆران»› ☰ درخت و بوتە

**درەختی** / dirextî/: ئاوەڵناو. داری؛ پێوەندیدار یان سەر بە دارەوە ‹سێوی درەختی› ☰ درختی

**درەخشان** / d(i)rexşan/: ئاوەڵناو. بەدرەوشە؛ درۆشن؛ ڕۆشن؛ شەوقدار؛ ڕووناک؛ خەڕڕا؛ تەیسۆک؛ تەیسان؛ ڕووناهیدەر؛ بە درەوشین؛ بە بریقە؛ بە تابشتی نوورانییەوە ☰ درخشان

**درەخشانەوە** / d(i)rexşanewe/: چاوگ. درەخشینەوە؛ بریقە دان ☰ درخشیدن

**درەخشیان** / d(i)rexş(i)yan/: ☚ **درەوشان**

**درەخشینەوە** / d(i)rexşînewe/: ☚ **درەخشانەوە**

**درەشە** / d(i)reşe/: ☚ **درەوش-۱**

**درەغ** / d(i)reğ/: ناو. شەنکێش؛ چەوکێش ☰ شنکش

**درەم** / d(i)rem/: ناو. ۱. سێ بەش لە چوار بەشی مسقال ۲. کێشێک بەرانبەری بیست گرەم ۳. کێشێک بەرانبەری نیو کیلۆ ٤. ☚ **درهەم** ☰ ۱. هجده قیراط ۲. بیست گرم ۳. نیم کیلو ۴. ☚ **درهەم**

**درەنگ**[1] / d(i)reng/: ناو. ۱. دێر؛ دێرس؛ کاتێکی درێژخایەن ‹تا کەی خەمی زوو کۆچ دەکەم و دێر هاتم/ مەی تێکە وەخۆین درەنگ و زووی پێناوێ «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ۲. دێرهات؛ دواکەوت؛ کار و ڕەوتی دوا کەوتن و دوا خستن ‹تاژدین لە نیاز گەیی بەبێ درەنگ/ دی بەسیەتی کات و دڵ بکا تەنگ «هەژار، *مەموزین*»› ۳. دۆخی وە دوا کەوتن ☰ ۱و۲. دیر ۳. تأخیر

**درەنگ**[2]: ئاوەڵناو. دێر؛ درەنگان ‹ئەگەرچی شەو درەنگە، ساقی بۆم تێکە کەمێکیتر/ کەوا ئەمشەو سەری هەڵدا لە ناخمدا خەمێکیتر «هێمن»› ☰ دیروقت

**درەنگ**[3]: ئاوەڵکار. دێر ‹دێر هات و درەنگ چوو› ☰ دیر

**درەنگان / d(i)rengan/**: ئاوەڵکار. کاتێکی دێر ‹شەتەک درا لە دار درەنگانی شەو/ لاوێک لە سەر ڕزگار بوونی وەتەنی «هێمن»› ☰ دیرگاه

**درەنگانێ / d(i)renganê/**: ئاوەڵکار. تاریکان؛ لە سەرەتای شەودا؛ کاتی شێوان ☰ هنگام غروب

**درەنگی / d(i)rengî/**: ☜ دێری

**درەو / d(i)rew/**: ناو. ١. دروێنە ٢. ☜ درۆ ☰ ١. درو ٢. ☜ درۆ

**درەوان / d(i)rewan/**: ☜ درویتەوان

**درەوسای / d(i)rewsay/**: چاوگ. ڕوان ☰ روییدن

**درەوش / d(i)rewş/**: ناو. ١. درەوشە؛ درەشە؛ درۆش؛ درێشە؛ درێشک؛ درپشە؛ دەرزی دەسکداری چەرم کون کردن ٢. بریقە؛ تررووسکە ☰ ١. درفش پینەدوزی ٢. درخشش

**درەوشان / d(i)rewşan/**: چاوگ. دروشیان؛ دروشین؛ درەوشین؛ درەخشیان؛ درەوشانەوە ☰ درخشیدن

**درەوشاندن / d(i)rewşandin/**: چاوگ. درۆشنای؛ درەوشین ☰ درخشاندن

**درەوشانەوە / d(i)rewşanewe/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //درەوشایەوە؛ دەدرەوشییەوە؛ بدرەوشێوە// درەوشیانەوە؛ درەوشینەوە؛ درەخشیان؛ درەخشانەوە؛ درەخشینەوە؛ زەڕقین: ١. تررووسکانەوە؛ برووسکانەوە؛ شەوق دان؛ زەڕیقین ‹چراکانی شار دەدرەوشانەوە› ٢. بریقانەوە؛ بریقە دانەوە؛ شەوق دانەوە ‹چاوی لە تاریکی شەودا دەدرەوشاوە› ٣. *[مەجاز]* کارێکی بەرچاو کردن ‹هیوا ئەمشەو لە کۆنسێرتدا چاک درەوشایەوە› ☰ ١تا٣. درخشیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: درەوشاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەدرەوشانەوە

**درەوشای / d(i)rewşay/**: ☜ درۆشیای

**درەوشە / d(i)rewşe/**: ناو. برووسکە؛ بریسکە؛ چرووسکە؛ تروسکە؛ تیسکە؛ وریشە؛ ورشە؛ چۆنیەتی درەوشانەوە ‹درەوشەی خۆر› ☰ درخشش

**درەوشەدار / d(i)rewşedar/**: ئاوەڵناو. بریکەدار؛ ورشەدار؛ وریشەدار ☰ برّاق

**درەوشیانەوە / d(i)rewş(i)yanewe/**: ☜ درەوشانەوە

**درەوشین / d(i)rewşîn/**: ☜ درەوشان

**درەوشینەوە / d(i)rewşînewe/**: ☜ درەوشانەوە

**درەوکەر[1] / d(i)rewker/**: ☜ درویتەوان

**درەوکەر[2]**: ☜ درۆزن

**درهەم / dirhem/**: ناو. درەم؛ دێرهەم: ١. *[کۆن]* یەکەی پارەی زۆرێک لە وڵاتانی ئیسلامی لە ڕابردوودا ٢. یەکەی پارەی ئیماراتی عەرەبی و مەراکیش ☰ ١و٢. درهم

**دری / d(i)rî/**: لێل. ← دریبەردە

**دریا / dirya/**: ☜ درگا

**دریان / diryan/**: ☜ دران[1]

**دریانە / diryane/**: ☜ درگانە

**دریبەردە / d(i)rîberde/**: ئاوەڵناو. شەرمەزار؛ شەرمسار؛ شەرمەندە؛ سەرشۆڕ؛ ڕووزەرد؛ خەجاڵەتبار؛ فەدیکار ☰ شرمسار

**دریچە / d(i)rîçe/**: ناو. ١. کولانە لە دیواردا ٢. بۆتە؛ ئامرازی زێڕ و زیو تێدا تواندنەوە ☰ ١. روزنە؛ دریچە ٢. بوتەی ریختەگری

**دریژ / d(i)rîj/**: ☜ درێژ

**دریسمە / d(i)rîsme/**: ناو. ڕێسمە؛ پاژنەی درگا ☰ پاشنەی در

**دریشە / d(i)rîşe/**: ☜ درەوش-١

**دریڤ / d(i)rîv/**: ☜ دراو-١

**دریۆزەکەر / diryozeker/**: ☜ دەرۆزەکەر

**درێ / d(i)rê/**: ☜ درۆ

**درێخ[1] / d(i)rêx/**: ناو. درێخی؛ درێغ؛ درێغی؛

کۆتایی؛ کەمتەرخەمی ☰ قصور؛ کوتاهی

⊡ **دریخ کردن**: ۱. گوێ پێ نەدان ‹بۆ دریخت کرد؟› ۲. نەدان؛ نەدانی شتێ بەتایبەت بە ئەمانەت ‹هەرچیت لێم بوێ، بەو مەرجەی بمبێ، دریخ ناکەم› ☰ ۱. کوتاهی کردن ۲. در اختیار نگذاشتن

**دریخ**[۲]: دەنگ. دریغ؛ خۆزگە؛ بریا ‹دریخ جە خاودا شامار بگەستام/ چەنی بێبەینەت، بەینەت نەبەستام «بێسارانی»› ☰ دریغا

**دریخی / d(i)rêxî/**: ☜ **دریخ**[۱]

⊡ **دریخی کردن**: گوێ پێ نەدان ‹لەم کارەدا دریخی مەکە!› ☰ کوتاهی کردن

**درێژ / d(i)rêj/**: ئاوەڵناو. درێژ: ۱. بە لاەیکدا کێشراو ۲. */پەلار/* بالابەرز ۳. دوور و درێژ؛ درێژەدار ‹چیرۆکی درێژ› ٤. بە درێژایی زۆرەوە ‹بەنی درێژ› ☰ ۱. دراز ۲. بلندقد ۳و ۴. طولانی

⊡ **درێژ تا نێوارە**: */پەلار/* زۆر درێژ و پێنەکەوتوو (مرۆ) ☰ بسیار دراز و بی‌قواره

⊡ **درێژ بوون**: درێژ بوونەوە: ۱. درێژەو بوون ۲. ڕازان؛ ڕاکشان؛ پاڵ کەفتن ‹درێژ دەبوون و هەڵدەستانەوە/ لە ناو شینکەدا دەتلانەوە «هێمن»› ۳. */کینایە/* مردن ☰ ۱. دراز شدن ۲. دراز کشیدن ۳. مُردن

**درێژ بوونەوە**: ۱. ماوە زیاد کردن؛ ماوەی زۆر پێچوون ۲. ☜ **درێژ بوون** ☰ ۱. بە درازا کشیدن ۲. ☜ **درێژ بوون**

**درێژ کردن**: ۱. لە دوا دان ۲. ماوە پێدان ۳. لە سەر زەوی ڕاکێشان ☰ ۱. تفصیل دادن ۲. درنگ کردن ۳. بر زمین دراز کردن

**درێژ کردنەوە**: ۱. لە کورتییەوە لە دوا دان ۲. */مەجاز/* پتر لە پێویست قسە کردن ☰ ۱. درازتر کردن ۲. تفصیل دادن

**درێژا / d(i)rêja/**: ☜ **درێژایی**

**درێژاودرێژ**[۱] **/ d(i)rêjawd(i)rêj/**: ئاوەڵناو. درێژەکی؛ پێوەندیدار بە درێژییەوە ‹ماڵی درێژاودرێژ› ☰ طولی

**درێژاودرێژ**[۲]: ئاوەڵکار. بە درێژادا؛ بە درێژیدا؛ بە باری درێژاییدا ‹پارچەکە درێژاودرێژ ببڕە› ☰ اندکی دراز

**درێژاهی / d(i)rêjahî/**: ☜ **درێژایی**

**درێژایی / d(i)rêjayî/**: ناو. درێژی؛ درێژا؛ درێژاهی: ۱. درێژترین لا یان باری شتێک ‹قاڵییەکە بە درێژاییدا داخە!› ۲. ئەندازەی کێشراوی یان درێژی شتێ بە پێی یەکەی پێوانەی درێژایی ‹درێژایی ئەم دیوە چوار میترە› ☰ ۱و۲. درازا

**درێژبوو / d(i)rêjbû/**: ئاوەڵناو. وەرانتا؛ هەڵاژیاگ ☰ درازکشیده

**درێژخایەن / d(i)rêjxayen/**: ئاوەڵناو. درێژخایێن؛ زۆرخایێن: ۱. بە ماوەی زۆرەوە ‹سەخت و ناهەموارە ئەم ڕێگایە، کوردی کۆڵنەدەر!/ بۆ خەباتێکی درێژخایەن گوڕ و تینم دەوێ «هێمن»› ۲. زۆر کاتگر ☰ ۱. بلندمدت ۲. بسیار وقت‌گیر

**درێژخایێن / d(i)rêjxayên/**: ☜ **درێژخایەن**

**درێژدادڕ / d(i)rêjdadiř/**: ئاوەڵناو. */پەلار/* زۆربلێ؛ چەقەسرۆ ☰ پرگو؛ وراج

**درێژدادڕی / d(i)rêjdad(i)řî/**: ناو. */پەلار/* زۆروێژی؛ چەنەبازی ☰ پُرگویی؛ رودەدرازی

**درێژداهۆڵ / d(i)rêjdahoł/**: ئاوەڵناو. */پەلار/* درێژی لاواز ☰ دراز لاغراندام

**درێژڕاکشاو / d(i)rêjřak(i)şaw/**: ئاوەڵناو. تلار؛ هەڵاژیاگ؛ خۆ درێژکردوو ☰ درازکشیده

**درێژکۆڵە**[۱] **/ d(i)rêjkołe/**: ناو. درێژووکە؛ لاکێش؛ لاکێشە؛ تەشک؛ بیچمێکی تەختی هیندسی چوارلاسک، کە لاسکەکانی بەرامبەر یەکسان و هاوشانن ☰ مُستطیل

**دریژکۆڵە**[٢]: ئاوەڵناو. کەمێک دریژ ≡ اندکی دراز

**دریژن** / d(i)rêjin/: ☜ **دریژە**

**دریژنوسی** / d(i)rêjnûsî/: ناو. ١. بارودۆخی زۆر نووسین و پەراوێز و پیارزگ هەڵبەستن ٢. کاری نووسینی ڕستەی دریژ و هەناسەبڕ ≡ ١و٢. درازنویسی

**دریژنە** / d(i)rêjne/: ناو. ڕۆچن؛ ڕۆچنە ≡ روزنەی بام

**دریژوکە** / d(i)rêjûke/: ☜ **دریژکۆڵە**[١]

**دریژە** / d(i)rêje/: ناو. دریژن؛ تەرەک: ١. پاشکۆ؛ پاشماوە؛ بەشێ لە شتێک کە بە دوای بەشی سەرەتاییەوە دێ ‹دریژەی چیرۆک› ٢. کار و ڕەوتی لەسەرڕۆیشتن؛ شوێن کەوتنی کارێ ‹دریژەی بە خوێندن دا› ≡ ١. دنباله ٢. ادامه

⊡ **دریژە پێ دان**: ١. لە سەر قسە ڕۆیشتن ٢. شوێن گرتن؛ دەست هەڵنەگرتن ≡ ١. تفصیل دادن سخن ٢. ادامه دادن

**دریژە دان**: دۆماندن؛ لە سەر ڕۆیشتن ≡ ادامه دادن

**دریژە سەندن**: ☜ **دریژە کێشان**

**دریژە کێشان**: بەردەوام بوون؛ دریژە سەندن؛ دوایی نەهاتن و لە گەڕاندا بوون ‹قسە کردن تا نیوەی شەو دریژەی کێشا› ≡ ادامه یافتن

**دریژە هەبون**: کۆتایی نەهاتن؛ بەردەوام بوون؛ نەبڕانەوە ≡ ادامه داشتن

**دریژەدار** / d(i)rêjedar/: ئاوەڵناو. هێشتا کۆتایی پێ نەهاتوو ≡ دنبالەدار؛ ادامەدار

**دریژی** / d(i)rêjî/: ناو. دریژایی؛ دۆخ یان چۆنیەتی دریژ بوون ≡ درازی

**دریشک** / d(i)rêşk/: ☜ **درەوش-١**

**دریشۆکە** / d(i)rêşoke/: ☜ **دوریشی**

**دریشوشک** / d(i)rêşûşk/: ☜ **دریشوشکە**

**دریشوشکە** / d(i)rêşûşke/: ناو. دریشووشک؛ چز ≡ نیش

**دریشوکە** / d(i)rêşûke/: ناو. زمانی مار ≡ زبان مار

**دریشە** / d(i)rêşe/: ☜ **درەوش-١**

**دریغ** / d(i)rêğ/: ☜ **دریخ**

**دریغی** / d(i)rêğî/: ☜ **دریخ**[١]

**دریلە** / d(i)rêle/: ناو. گیایەکە ≡ گیاهی است

**دریڵ** / d(i)rêł/: ناو. بەهرەمە ≡ دریل

**دریڵی** / d(i)rêłî/: ناو. ڕوەکێکی خۆڕسکە لە تیرەی چەقچەقە، ٣-٤ سانتیمیتر بەرز دەبێ، چەن گوڵی زەردی ڕوون لە سەر پۆپەکەی دەڕوێ، مێشەنگوین زۆری حەز لێیە ≡ گیاهی است از تیرەی کاسنیان

**درینە** / d(i)rêne/: ☜ **درویتە**

**دڕ**[١] / diř/: ↓

⊡ **دڕ پێدان**: ١. گوشاد کردن؛ پان کردنەوەی بەرایی شتێ ٢. خۆ بە ئاپۆرەی خەڵکدا کردن و ڕێباز کردن ‹دڕی بە خەڵکەکە دا و هاتە ژووری› ≡ ١. وسعت بخشیدن ٢. باز کردن راه در میان تودەی مردم

**دڕ دان**: ڕێگە کردنەوە لە ناو حەشامات ≡ راه باز کردن در شلوغی

**دڕ**[٢]: ئاوەڵناو. ١. دڕندە؛ دڕنە؛ دوڕوونە؛ دڕنە؛ دەهبە؛ تیڕوو؛ ڕاور؛ بە تایبەتمەندی و توانای دڕندە بوونەوە ‹سەگی دڕ› ٢. *[مەجاز]* زبر؛ نەترسی بەدفەڕ ‹پیاوێکی دڕە› ٣. بەهێزی ڕەنگی لە نیگارکێشیدا (وەک: ڕەش و شین) ٤. دڕک؛ دڕوو ‹فڕێی دا دڕ و داڵی جەور و جەفا/ چەقاندی لە جێی باغی سولح و سەفا «هەژار، *ئاڵەکۆک*»› ≡ ١. درندە ٢. پرخاشگر ٣. پرقدرت (رنگ در نقاشی) ۴. خار

• **دڕ**[٢]: پاشەوشە. بدڕ ‹دە لە کەرێکیش بپرسن: گورگت دیوە؟ کەردڕ نەبێ؟ «پەشێو»› ≡ درندە

**دڕاجە** / d(i)řace/: ☜ **دوڕەگ**

**دڕان** / d(i)řan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //دڕای؛ دەدڕێ؛

بدڕێ// دڕیان: ١. شڕ بوون؛ لێک بوونەوە ‹بیکە بەر دیبایی نەزمم تا قیامەت نادڕێ/ چونکە ئەبکاری مەعانی تار و پۆیی ڕستووە «حاجی قادر»› ٢. *[مەجاز]* ئێرەیی پێبردن ‹کە من سەرکەوتم، خەریک بوو بدڕێ› ٣. *[مەجاز]* خۆ خواردنەوە ‹کوانێ؟ لە کوێیە ببینێ بەزمم؟/ بدڕێ دوژمنی خوێڕی، مەغروور «هێمن»› ٤. *[مەجاز]* دەرکەوتن؛ هەموو پێ زانین ‹هێندەی پێ نەچوو قسەکە دڕا و مەعلووم بوو پێشەوا و ... لە چوارچرا لە دار دراون «هێمن، *تاریک و ڕوون*»› 🇮🇷 ١. پارە شدن ٢. حسادت کردن ٣. خودخوری کردن ۴. برملا شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: دڕاو/ چاوگی نەرێنی: نەدڕان

**دڕانـدن / d(i)řandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //دڕانـدت؛ دەدڕێنی؛ بدڕێنە// دڕانن؛ لەت کردن؛ شڕ کردن 🇮🇷 پارە کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەدڕاندن

**دڕانن / d(i)řanin/**: ☜ **دڕاندن**

**دڕاو / d(i)řaw/**: ئاوەڵناو. دڕیاگ؛ دڕیاو؛ لە بەر یەک چوو ‹ئەرێ ئەی تاوی هاوینی هەژاران!/ بکە ڕەحمێ بە سەربەرگی دڕاوم «ئاوات»› 🇮🇷 پارە

**دڕاوی / d(i)řawî/**: ناو. دڕیاگی؛ شڕ و لەتی 🇮🇷 پارگی

**دڕدوک / diřduk/**: ئاوەڵناو. دڕدۆک؛ هەڵقورتێن؛ خۆتێهەڵقوتێن؛ خشپن؛ خت‌پشکەر؛ لاپرەسەن؛ لاپلەرسەنگ؛ لاپلار؛ لاپواز؛ لاوەلا؛ لابەلا؛ هۆگری خۆ هەڵقوتاندنە ناو کاری وا کە فڕی بە سەرییەوە نەبێ 🇮🇷 فضول

**دڕدۆک / diřdok/**: ☜ **دڕدوک**

**دڕدۆنگ / diřdong/**: ئاوەڵناو. دوودڵ؛ بەگومان 🇮🇷 دودل

**دڕدۆنگی / diřdongî/**: ناو. دڵێ ـ دڵێ؛ سێ و دوو؛ شک؛ گومان 🇮🇷 شک

**دڕدەی / diřdey/**: ☜ **دڕیەی ـ٢**

**دڕک / diř(i)k/**: ناو. چقڵ؛ دڕوو؛ دڕی 🇮🇷 خار

**دڕکاڵ / diřkał/**: ☜ **دڕکاوی**

**دڕکاوی / diř(i)kawî/**: ئاوەڵناو. دڕکدار؛ دڕکین؛ دڕواوی؛ دڕکینە؛ چقڵاوی؛ بەچقڵ؛ دڕکاڵ؛ دڕکۆڵ؛ پڕدڕک 🇮🇷 خاردار

**دڕکدار / diřikdar/**: ☜ **دڕکاوی**

**دڕکوداڵ / diřik û dał/**: ناو. گیا و دڕووی بابردەڵەی وشک ‹وە ڕووژ دەسکەنەی دڕکوداڵ ئەکەم/ وە شەو ژمارەی وردەخاڵ ئەکەم «فولکلۆر»› 🇮🇷 خار و خاشاک

**دڕکۆڵ / diřkoł/**: ☜ **دڕکاوی**

**دڕکە / diřke/**: ناو. جۆرێ زیپکە، سەری وەک نووکی دەرزی وایە 🇮🇷 نوعی جوش

**دڕکەئاسنینە / diřke'as(i)nîne/**: ناو. دڕکەڵەوێ؛ گیایەکی گەلاپانی دڕکاوییە 🇮🇷 گیاهی خاردار

**دڕکەبا / diřkeba/**: ناو. دڕکەکەرە؛ دڕکەولاخ؛ دڕکەپووشین؛ ئاریشوو؛ حەشەکوژە؛ دڕەهەڕی؛ ڕووەکێکی یەکسالانە، گەلاکانی درێژ و پەل پەلە و لە سەرەوە گوڵێکی شینی گەورە دەر دەکا 🇮🇷 کنگر فرنگی

**دڕکەبوولێنە / diřkebûłîne/**: ☜ **دڕووەشینە**

**دڕکەپەتک / diřkepet(i)k/**: ناو. پەتێکی سپی کۆئەندامی دەماریی ناوەندییە، لە کونی پاشە سەرەوە تا دووهەمین بڕبڕەی کەمەر درێژە دەستێنێ 🇮🇷 طناب نخاعی

**دڕکەجاڕ / diřkecař/**: ناو. دڕکەزار؛ دڕکەسان؛ دڕکەلان؛ دڕووەلان؛ جێگەی دڕوان؛ شوێنی پڕچقڵ 🇮🇷 خارزار

**دڕکەخەنجەر / diřkexencer/**: ناو. تۆسی؛ تیس؛ کەرتەشی 🇮🇷 اشنان

**دڕکەدزی / diřked(i)zî/**: ناو. تەڵووک؛ زینە 🇮🇷 خارِ پرچین

**دڕکەدوو / diřkedû/**: ☜ **دانەوێڵە**

**درکەدەرزی / dirkederzî/**: ناو. دڕووەبزمارە ☰ خار زرد؛ خار شیری

**درکەدەوا / dirkedewa/**: ☜ **دڕەدەوا**

**درکەزار / dirkezar/**: ☜ **دڕکەجاڕ**

**درکەزە / dirkeze/**: ☜ **دڕکەزی**

**درکەزی / dirkezî/**: ناو. دڕکەزە؛ ولەتس؛ پنچکە دڕکێکە دەیکەنە پەرژین ☰ خاری برای پرچین

**درکەژاڵ / dirkejał/**: ناو. حوشترالۆک؛ وشترخۆرە؛ شیرحوشتر؛ وشتردڕک؛ ستریشینک؛ کولەواڕ؛ یانداخ؛ عەگول؛ عاگول؛ کاویر؛ بنەگیایەکی گەلاجووتی دوور لە یەکە بە دڕکی درێژ و سەوزەوە، ماکێکی شیرین بە ناوی ترەنجەبین دەدەڵێنێ ☰ خارشتر

**درکەسان / dirkesan/**: ☜ **دڕکەجاڕ**

**درکەکەرە / dirkekere/**: ☜ **دڕکەبا**

**درکەکەوە / dirkekewe/**: ناو. دڕکەمریەم؛ دڕکەبوولینە؛ گیایەکی ١-٢ ساڵەیە، لە ٣٠ تا ٢٠٠ سانتیمیرت بالا دەکا، گەلاکانی چوارگۆش یان نێزەییە، گوڵ تۆپێکی سوور ـ بنەوش لە ترۆپکی لاسقەکەیدا دەڕوێ ☰ خار مریم

**درکەگورزە / dirkegurze/**: ناو. کەرتەشی؛ گورزەگیا ☰ خارشکر تیغال

**درکەلان / dirkełan/**: ☜ **دڕکەجاڕ**

**درکەڵەوێ / dirkełewê/**: ☜ **دڕکەئاسنینە**

**درکەولاخ / dirkew(i)łax/**: ☜ **دڕکەبا**

**درکین / dirkîn/**: ☜ **دڕکاوی**

**درکینە**[1] **/ dir(i)kîne/**: ناو. *[مەجاز]* جووجکی تازە تووکلێهاتوو ☰ جوجەی سیخ‌پر

**درکینە**[2]: ☜ **دڕکاوی**

**درگە / dirge/**: ناو. ١. ☜ **دوڕگە** ٢. کەند؛ ئاودڕ ☰ ١. ☜ **دوڕگە** ٢. کنداب

**درن**[1] **/ dirin/**: ناو. ١. بۆنی تەگە لە کاتی تێبەرداندا ٢. بۆنی ماسی ٣. بۆنی گرانی لەش ☰ ١. بوی تگە ٢. بوی ماهی ٣. شماگند

**درن**[2]: ↓

◘ **درن دان**: ڕێگە باز کردن ☰ جا باز کردن

**درناڵ / dirnał/**: ناو. درناو: ١. بوودڕ؛ کەندالی ئاودڕ ٢. نۆکەند؛ کەنداو ٣. خەلیج ☰ ١. آبکند ٢. کانال ٣. خلیج

**درناو / dirnaw/**: ناو. دەلاو؛ درناڵ؛ کەنداو؛ خەلیج؛ پێشەوەچوویی ئاوی دەریا لە وشکانیدا ☰ خلیج

**درنای / dirnay/**: چاوگ. دڕین؛ دڕاندن ☰ پارە کردن

**درندانە / d(i)rindane/**: ئاوەلکار. وەحشییانە؛ بە دڕندەیی ☰ وحشیانە

**درندایەتی / dirindayetî/**: ناو. دۆخ یان چۆنیەتی دڕندە بوون ☰ درندەخویی

**درندە / d(i)rinde/**: ئاوەلناو. دڕ؛ دڕننە؛ دوڕوننە؛ دڕوندە؛ دەهبە؛ تیروو؛ ڕاوڕ؛ بە تایبەتمەندی و توانای دڕ بوونەوە ☰ درندە

**درندەیی / d(i)rindeyî/**: ناو. دڕننەیی؛ هۆڤینی؛ هۆڤیتی ☰ وحشیگری

**درننە / d(i)rinne/**: ☜ **دڕندە**

**درننەیی / d(i)rinneyî/**: ☜ **دڕندەیی**

**درنە / dirne/**: ☜ **دڕ**[2]**ـ١**

**درواوی / diruwawî/**: ئاوەلناو. خاردار؛ دڕکاوی؛ بەچقل ☰ خاردار

**دروندە / d(i)runde/**: ☜ **دڕندە**

**درەوەدەوا / dirwedewa/**: ☜ **دڕەدەوا**

**دڕۆپ / d(i)rop/**: ☜ **دلۆپ**

**دڕۆک / d(i)rok/**: ناو. کەلپ؛ کەلوە؛ گیرکە؛ ددانی تیژی دڕندە ☰ ناب درندە

**دڕۆم / d(i)rom/**: ناو. درم؛ پەتا؛ ئازار؛ ئاهۆ؛ دروشە ☰ بیماری واگیر

**دڕوو / d(i)rû/**: ☜ **دڕک**

▣ **درِو کردن:** درِک کۆ کردنەوە ☰ خار کندن

**درِو لە پای کەسێ دەرهێنان:** /کینایە/ درِوو لە لەشی کەسێ کردنەوە؛ بە هانای کەسێکەوە چوون ☰ خار از پای کسی کندن

**درِو لە لەشی کەسێ کردنەوە:** ☜ **درِو لە پای کەسێ دەرهێنان**

**درِوله / d(i)řûle/:** ☜ **درِوومامیلکە**

**درِوومامیلکە / d(i)řûmamîlke/:** ناو. درِوولە؛ گیادرِوو؛ وەستامستەفا؛ نەرمەبەدۆ؛ گیایەکە درِواوی لە دۆکلێوی دەکەن ☰ نوعی سبزی برای آش دوغ

**درِوون / d(i)řûn/:** ☜ **درِین**

**درِووەبزمارە/ d(i)řûwebizmare/:** ☜ **درِکەدەرزی**

**درِووەپوورایشێ / d(i)řûwepûrayşê/:** ناو. درِکێکی شینە، پەپوولە پایزە دەردەکا ☰ خاری است

**درِووەزەردە / d(i)řûwezerde/:** ناو. درِوووەزەرکە؛ زەردەسیری؛ درِووەکاخلی؛ جۆرێ درِکی زەردی تیژە ☰ خار زرد

**درِووەزەرکە / d(i)řûwezerke/:** ☜ **درِووەزەردە**

**درِووەشینە / diřûweşîne/:** ناو. دەرمانەحەفوو؛ درِکەبوولینە؛ درِکەکەوە ☰ خار نقرەای

**درِووەکاخلی / d(i)řûwekax(i)łi/:** ☜ **درِووەزەردە**

**درِووەکەلەوە / diřûwekełewe/:** ناو. سەپان ترِێنە؛ چۆکشکێنە؛ ناوی درِوویەکە لە بەراوان شین دەبێ، درِکەکەی زۆر سەخت و تیژە ☰ نوعی خار

**درِووەلان / diřûwełan/:** ناو. درِکەجار؛ درِکەزار؛ درِکەلان؛ شوێنی پرِچقڵ ☰ خارستان

**درِەبا / d(i)řeba/:** ناو. رِەشەبا ☰ توفان

**درِەدەوا / d(i)ředewa/:** ناو. درِکەدەوا؛ درِوەدەوا؛ کەرکۆڵ ☰ خار مقدس

**درِەسووچە / d(i)řesûçe/:** ناو. پێکوڵ؛ کونجر؛ پەیکۆڵ؛ خەسک ☰ خارخسک

**درِەماسی / d(i)řemasî/:** ناو. دەرِەماسی؛ دەرِەماهی ☰ خارماهی

**درِەنە / d(i)řene/:** چاوگ. شرِ کردن؛ درِین ☰ دریدن

**درِەهی / d(i)řehî/:** ناو. زەمینی فرە قەڵشیو؛ کێلگەی شەقار ـ شەقار ☰ زمین پُرشکاف

**درِەیلێ / d(i)řeylê/:** ☜ **دەرزی گیا**

**درِی / d(i)ři/:** ناو. ١. ☜ **درِک** ٢. پنجی تووترِک ٣. دۆخی درِ بوون ☰ ١. ☜ **درِک** ٢. بوتەی تمشک ٣. درندگی

**درِیاگ / diřyag/:** ☜ **درِاو**

**درِیاگی / diřyagî/:** ناو. درِاوی؛ شرِ و لەتی ☰ پارگی

**درِیان / diřyan/:** ☜ **درِان**

**درِیاو / diřyaw/:** ☜ **درِاو**

**درِیای / diřyay/:** چاوگ. درِان ☰ پارە شدن

**درِین / d(i)řîn/:** چاوگ. تێپەرِ. //درِیت؛ دەدرِی؛ بدرِە// دادرِین؛ درِاندن؛ درِوون ☰ پارە کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەدرِین

**درِیەی / diřyey/:** چاوگ. ١. درِان ٢. درِدەی؛ درِاندن ☰ ١. پارە شدن ٢. پارە کردن

**درِێلە / d(i)řêle/:** ناو. ١. درِکە؛ زیپکەی ورد کە لە منالان دێت ٢. درِێلەباخی؛ قەیسەکوژ؛ گیایەکی کورتەبالایە دەیکولێنن ئاوەکەی بۆ رِەواندنەوەی خەم و خەفەت باشە ☰ ١. جوش ریز بدن کودکان ٢. ترتیزک چمنی

**درِێلەباخی / d(i)řêlebaxî/:** ☜ **درِێلە ـ٢**

**درِێڵە / d(i)řêłe/:** ناو. سووکسووکە؛ دانکە؛ دانیە؛ خووریکەی مریشک؛ ئازارە مریشک ☰ آبلەمُرغان

**دز[١] / diz/:** ناو. ١. ماڵبرِ؛ قەرەپشی؛ شەوکوت؛ چاپ؛ ئەبابۆز؛ دزۆکەر؛ دوێز؛ بردە؛ بەیگر؛ کەسێ کە ماڵی خەڵک بە نهێنی و بێ‌ئاگایان دەبا ‹دز یەکە و شک هەزار «مەسەل»› ٢. چکەی جک ٣. ☜ **دز[١]ـ١** ☰ ١. دُزد ٢. گود شتالنگ ٣. ☜

**دز[1]ـ١**

◙ **دزی گەردەنە:** ڕێگر؛ چەتە؛ گۆران ▤ راهزن

⊡ **دز بردن:** دزران ▤ دزد بردن

**دز گرتن:** قۆڵبەست کردنی دز ▤ دزد گرفتن

**دز لێدان:** کەوتنە بەر دزی ‹دز دای لە ماڵەکەم› ▤ دزد بردن

**دز[2]:** ئاوەڵناو. دەس‌لار؛ دەست‌حیز ▤ دُزد

**ـ دز[3]:** پاشەوشە. ١. ئەوەی کاری دزین بێ ‹کەوش‌دز؛ کتێب‌دز› ٢. شوێن یان کاری دزە کردن ‹ئاودز› ▤ ١. ـ دُزد ٢. ـ دُزدک

**دزان** / d(i)zan/: چاوگ. ڕک لێ‌بوونەوە؛ ناخۆش ویستن ‹مار سیری دەدزا، لە دەرکی کونی ڕوا!؛ میوان میوانی دەدزا، خانەخوێ هەردووک لا! «مەسەل»› ▤ بیزار بودن

**دزانە[1]** / d(i)zane/: ئاوەڵناو. دزئاسا؛ دزئاسایی ‹کاری دزانە› ▤ دزدکی

**دزانە[2]:** ئاوەڵکار. بە دزییەوە؛ بە دزییەکەوە؛ وە دزیکەو؛ بە دزەدز؛ بێدزی؛ بێدزەی؛ خنز؛ بە نهێنی؛ لە بنەوە ‹دزانە دێت و دەڕوا› ▤ دزدکی

**دزاو[1]** / d(i)zaw/: ناو. ئاوەدز ▤ ترشح

**دزاو[2]:** ☜ **دزراو**

**دزاودز** / d(i)zawdiz/: ↓

⊡ **دزاودز کەوتن:** دۆخی دوو کەس کە بۆ دیتنی یەکتر هاوکات ڕێ دەکەون و لە یەک ون دەبن ‹هەر تۆ قەولت دا، من شەو نەخەوتم/ هاتمە درگاکەت دزاودز کەوتم «فولکلور»› ▤ حالت دو نفری که همزمان برای دیدار هم به راه می‌افتند و یکدیگر را گم می‌کنند

**دزتەی** / diztey/: چاوگ. دزین ▤ دزدیدن

**دزخانە** / dizxane/: ناو. شارەدز؛ جێگایێ کە دزی زۆر بێ ▤ دزدبازار

**دزدار** / dizdar/: ☜ **دژدار**

**دزدان** / dizdan/: ناو. جزدان؛ کیسەی چەرمینی دراو ▤ کیسه‌ی چرمی پول

**دزدەسەک** / dizdesek/: ☜ **دایکەدزە**

**دزران** / dizran/: چاوگ. تێنەپەڕ. //دزرای؛ دەدزرێی؛ بدزرێ// بە دزی بران ▤ دزدیده شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: دزراو/ چاوگی نەرێنی: نەدزران

**دزراو** / dizraw/: ئاوەڵناو. دزاو؛ دزیاگ؛ بە نهێنی براو ‹کۆشکی ولاتی نامۆ لە دزراوی ڕەنجتان/ ڕازاوەیە، منالی ئەتۆش با لە دەرکەوێ «قانع»› ▤ دزدیده‌شده

**دزکۆژگە** / dizkojge/: ☜ **دزکۆشکە**

**دزکۆشکە** / dizkoşke/: ناو. ١. دزکۆژگە؛ مەکۆی دزان ‹بە شەو دزکۆشکەی مەریوانی بووم/ بە ڕۆژ گوزەرگای زولف‌قەترانی بووم «قانع»› ٢. لە بنەماڵە و شەریکەدز ▤ ١. مکان دزدان ٢. عضو خانواده و شریک دزد

**دزگا** / dizga/: ناو. دزکۆشکە ▤ محل دزدان

**دزگر** / dizgir/: ☜ **دزگیرـ١**

**دزگون** / dizgûn/: ناو. کاری پەسند و ڕێک و جوان ▤ کار پسند

**دزگەردەنە** / dizgerdene/: ناو. چەتە؛ ڕێگر؛ سەرڕێگر ▤ راهزن

**دزگیر** / dizgîr/: ناو. ١. دزگر؛ ئامێرێکی کارەبایی یان ئیلکترۆنیکی کە بۆ بەرگری لە دزی دادەنرێ و بە زریکاندن یان ڕۆشن کردنی چرا هەواڵ لە بوونی دز دەدا ٢. هەوسار؛ دەسکەڕێشمە ▤ ١. دزدگیر ٢. افسار

**دزگین[1]** / dizgîn/: ناو. هەوسار ▤ افسار

**دزگین[2]:** ئاوەڵناو. /پلار/ دزنەبەرە؛ دزنەخۆرە؛ بێ‌نرخ؛ هیچ‌وپووچ؛ نەهێژا ▤ بی‌ارزش

**دزنەبەرە** / diznebere/: ☜ **دزگین[2]**

**دزنەخۆرە** / diznexore/: ☜ **دزگین[2]**

**دزنێرۆ** / diznêro/: ئاوەڵناو. شۆفار؛ تێچین ▤

سخن‌چین

**دز و درۆزن / diz û d(i)rozin/:** ناو. *[مەجاز]* مرۆی نائەهل و بەدفەڕ ⯀ مردم نااهل

**دزۆکەر / d(i)zoker/:** ☜ **دز[1]ـ۱**

**دزە[1] / d(i)ze/:** ناو. دز؛ قەلات؛ قەلا ⯀ قلعه

**دزە[2]:** ↓

⊡ **دزە کردن:** ۱. پێدزە کردن؛ باریکەو بوون؛ خۆ دزینەوە ۲. لە درزی شتێکەوە چوونە دەر ‹تیشک لە درزی دەرگاکەوە دزەی دەکرد› ۳. *[مەجاز]* درکان؛ درکیای؛ کەوتنە دەرەوەی ڕازێک ⯀ ۱. جیم شدن ۲و۳. درز کردن

**دزەباوانی / d(i)zebawanî/:** ناو. *[فەرهەنگی خەڵک]* دابێکی کوردەواری کە بووک کاتێ باوەخوێن دەکرێتەوە شتێک لە ماڵی باوکی دەدزێ ⯀ از رسوم کهن مردم کرد

**دزەخەنە / d(i)zexene/:** ناو. بزە؛ زەردەخەنە ⯀ لبخند

**دزە ـ دزە / d(i)ze d(i)ze/:** ئاوەلکار. بە نهێنی؛ بە دزییەوە ‹دزە ـ دزە ڕۆیشت› ⯀ پنهانی

**دزەڕێیە / d(i)zeřîye/:** ناو. شەیتانەڕێ؛ ڕێگای حەشاردراو ⯀ راه مخفی

**دزەکە / d(i)zeke/:** ☜ **دایکەدزە**

**دزەکی / d(i)zekî/:** ئاوەلکار. بەدزییەوە؛ بێدزی؛ بە نهێنی ⯀ نانجیب؛ بداصل

**دزەکی[1] / d(i)zekî/:** ئاوەلناو. شاردراوە؛ قەشارتی؛ شاریاوە ‹مامەڵەی دزەکی› ⯀ پنهانی

**دزەکی[2]:** ئاوەلکار. بە دزییەوە؛ پەنامەکی؛ لە ژێرەوە ‹دزەکی مامەڵەیان دەکرد› ⯀ پنهانی

**دزەناموس / d(i)zenamûs/:** ناو. فاسق؛ پیاوێ کە لەگەڵ ژنی پیاوێکی‌تر کەین‌وبەینی هەیە ⯀ دزد ناموس

**دزی[1] / d(i)zî/:** ناو. چرپ؛ تالان و بڕۆ؛ کارەڕەهاتی بردنی ماڵی دیتران بەبێ ئاگاداریيان ⯀ دُزدی

**دزی[2]:** ئاوەلناو. دزیەتی: ۱. دزراو ‹ماڵی دزی› ۲. نهێنی؛ پەنامەکی ⯀ ۱. دُزدی ۲. پنهانی

**دزیار / dizyar/:** ناو. دەسکیس ⯀ راهنمای دُزد

**دزیاگ / dizyag/:** ☜ **دزراو**

**دزیتەنی / d(i)zîtenî/:** ناو. شتێ کە بۆ دزین دەست ئەدا ⯀ قابل دُزدیدن

**دزین / d(i)zîn/:** چاوگ. تێپەڕ. //دزیت؛ دەدزی؛ بدزە// ڕواکان؛ ڕواکانن؛ چرپانن؛ قەپان؛ شتێک بە نهێنی بۆ خۆ بردن ⯀ دزدیدن

■ ئاوەلناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەدزین

**دزینەوە / d(i)zînewe/:** چاوگ. ۱. لە خەرجی گێڕانەوە ۲. وەشارتن ‹خۆ دزینەوە› ⯀ ۱. صرفەجویی کردن ۲. پنهان کردن

**دزی‌وفزی / d(i)zî w f(i)zî/:** ناو. ڕاووڕیو؛ فێڵ‌وفەرەج ⯀ دوز و کلک

**دزیەتی[1] / dizyetî/:** ناو. دزی؛ دزێتی؛ چرپ؛ کارەڕەهاتی بردنی ماڵی دیتران بەبێ ئاگاداریيان ⯀ دُزدی

**دزیەتی[2]:** ئاوەلناو. دزێتی؛ دزراو ‹ماڵی دزیەتی› ⯀ دُزدی

**دزێتی / d(i)zêtî/:** ☜ **دزیەتی**

**دزێو / d(i)zêw/:** ئاوەلناو. ناحەز؛ ناشیرین ‹من لە جوانی دەگەڕێم، تێپەڕە زستانی دزێو/ کچ کە ڕووم نادەنێ، با سەیری گوڵ و شەونەم کەم «هێمن»› ⯀ زشت؛ بدگل

**دزێوی / d(i)zêwî/:** ناو. کرێتی؛ کەسنی؛ ناحەزی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ناشیرین و ناحەز بوون ‹... وەزارەتی دەست کەوت؛ بەلام لەبەر دزێوی، مێردی هەر دەس نەکەوت! «هەژار، چێشتی مجێور»› ⯀ زشتی

**دژ[1] / dij/:** ناو. ۱. قەلات؛ قەلا؛ برج؛ دز؛ دزە ‹سنەدژ› ۲. شەقلی خەرمان ۳. ☜ **دوژمن[1]** ⯀ ۱. قلعه ۲. مُهر چوبین خرمن ۳. ☜ **دوژمن[1]**

**دژ**[1]: ئاوەڵناو. دش: ١. پێچەوانە ‹گەردوون کە گەڕا دژی نیازی من و تۆ/ عاسمان بە مە چی هەشت و حەوت بن یا نۆ «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ٢. مات و کز ‹هەتا ماوەیەک دژ و وەڕمز بوو/ کەم ـ کەم دلداری پێشووی لە بیر چوو «هێمن»› ٣. گرژ؛ ڕووگرژ؛ ڕووترش 🇮🇷 ١. مخالف؛ ضد ٢. افسُرده ٣. اخمو

⊡ **دژ بون**: ١. پێچەوانە بوون ٢. مات و کز بوون ٣. ڕووترش کردن 🇮🇷 ١. مخالف بودن ٢. افسرده شدن ٣. اخم کردن

**دژ دامان**: دوش دامان؛ مات و کز دانیشتن ‹شاعیر! ماڵ شێواو! بۆ دژ داماوی؟/ گێژی، خەوالووی، شێتی، خەرفاوی «هێمن»› 🇮🇷 مات و افسرده بودن

**دژ دانەوە**: کاریگەری نالەبار هەبوون 🇮🇷 تأثیر منفی داشتن

**دژ کردن**: ١. ڕوو تێکنان؛ خۆ گرژ کردن ٢. قرتاندنی مووی کلکی جوانووە ئەسپ بۆ ئەوەی پڕ و جوان بێ 🇮🇷 ١. ابرو درهم کشیدن ٢. بریدن موی دم کرّەاسب

**دژ ـ**[2]: پێشوشە. ١. بڕ؛ لەنێوبەر ‹دژگەن› ٢. سەخت؛ سەخڵەت ‹دژپەسند› ٣. ناتەبا؛ ناسازگار ‹دژخۆراک› ٤. بەرگر؛ پێشگر ‹دژبا› 🇮🇷 ١. ضد ٢. دشوار ٣. بد ۴. مُخالف

**دژاو** / d(i)jaw/: ئاوەڵناو. ١. تایبەتمەندی مەزراییێک کە لێژ بێت و چاک ئاو نەخواتەوە ٢. تایبەتمەندی ئاژەڵێ کە مەیلی ئاو خواردنەوەی نییە 🇮🇷 ١. نامناسب جهت آبیاری (زمین) ٢. بی‌میل بە آب (حیوان)

**دژایەتی** / dijayetî/: ناو. دژی؛ دژێتی؛ بەرهەڵستی؛ نارێکی ‹هەر کەس بۆنی دژایەتی کومۆنیستی لێ دەهات، شەقی زۆری دەخوارد و ... «هەژار، *چێشتی مجێور*»› 🇮🇷 ضدیّت

⊡ **دژایەتی کردن**: بەرهەڵست بوون؛ دەربڕینی نەیاری خۆ ‹لەگەڵ ئێوەدا دژایەتییان دەکرد› 🇮🇷 ضدیت کردن

**دژبان** / dijban/: ☜ **دژوان**

**دژبەر** / dijber/: ئاوەڵناو. بەرهەڵستکار؛ لە دژی کارێک ڕاوەستاو 🇮🇷 مُعارض

**دژپەسند** / dijpesind/: ئاوەڵناو. دێرپەسەن؛ دژپەسەن؛ دوودڵ لە پەسند کردن و کڕینی شتان 🇮🇷 مُشکل‌پسند

**دژپەسەن** / dijpesen/: ☜ **دژپەسند**

**دژخۆر** / dijxor/: ☜ **دژخۆراک**

**دژخۆراک** / dijxorak/: ئاوەڵناو. دژخۆر؛ دوودڵ لە خواردەمەنیدا 🇮🇷 بدخوراک

**دژدار** / dijdar/: ناو. دزدار؛ قەڵاوان 🇮🇷 قلعه‌بان

**دژداشە** / dijdaşe/: ناو. دیژداشە؛ کراسی ئاوداوێن (عەرەبی) 🇮🇷 پیراهن بلنددامن

**دژداماو** / dijdamaw/: ئاوەڵناو. دوشداماو؛ کز و سیس دانیشتوو 🇮🇷 مات و افسرده

**دژدوێن** / dijd(i)wên/: ئاوەڵناو. کەمقسە 🇮🇷 کم‌حرف

**دژدین** / dijdîn/: ئاوەڵناو. لائیک 🇮🇷 لائیک

**دژڕابەر** / dijřaber/: ئاوەڵناو. لە بەرەو باجی لە پشتەو قەیچی؛ بەڕواڵەت دڵسۆز و لە ڕاستیدا دژ 🇮🇷 دورو

**دژکار** / dijkar/: ئاوەڵناو. دژ؛ نەیار 🇮🇷 مخالف

**دژکام** / dijkam/: ئاوەڵناو. تەرکەدنیا؛ خۆپارێز لە خۆشی دنیا 🇮🇷 پارسا؛ پرهیزکار

**دژگەن** / dijgen/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی دەرمانێ کە گەنیو لە ناو بەرێ 🇮🇷 گندزدا

⊡ **دژگەن کردن**: بەرگری کردن لە سەرهەڵدانی چڵک و ڕیم و پەرە ساندنی میکرۆب 🇮🇷 ضدعفونی کردن؛ گندزدایی کردن

**دژلەوەڕ** / dijleweř/: ئاوەڵناو. ناقی؛ دژخۆر؛

دژخۆراک (تێبینی: بە پلارەوە بۆ مرۆشی دەڵێن) ☜ بدخوراک

**دژمان** / dijman/: ناو. دژمێن؛ دژنام؛ دژنێو؛ دژمانی؛ دژون؛ دژوون؛ دژووین؛ دژوێن؛ دوژێن؛ دوژوێن؛ دمژین؛ دوژمان؛ دوژمین؛ دشمان؛ جوێن؛ سخێف؛ جنێو؛ خەراو ☜ دُشنام

**دژمانی** / dijmanî/: ☜ **دژمان**

**دژمن** / dijmin/: ☜ **دوژمن**

**دژمناتی** / dijm(i)natî/: ☜ **دوژمنایەتی**

**دژمنایەتی** / dijm(i)nayetî/: ☜ **دوژمنایەتی**

**دژمندار** / dijmindar/: ☜ **دوژمندار**

**دژمنی** / dijm(i)nî/: ☜ **دوژمنی**

**دژمەن** / dijmen/: ☜ **دوژمن**

**دژمەنی** / dijmenî/: ☜ **دوژمنایەتی**

**دژمین** / dijmîn/: ☜ **دوژمن**

**دژمێن** / dijmên/: ☜ **دژمان**

**دژنام** / dijnam/: ☜ **دژمان**

**دژنای** / dijnay/: چاوگ. گژاندن؛ ئاڵۆزاندن؛ شێواندن ☜ به هم ریختن؛ آشفتن

**دژنێو** / dijnêw/: ☜ **دژمان**

**دژوار** / dijwar/: ئاوەڵناو. دشوار؛ دوژوار؛ دوخشار؛ چەتوون؛ سەخت ☜ دشوار

**دژواری** / dijwarî/: ناو. دشواری؛ دوژواری؛ چەتوونی؛ سەختی ☜ دشواری

**دژواز** / dijwaz/: ئاوەڵناو. ناتەبا؛ دژیەک ☜ مُتضاد

**دژوان** / dijwan/: ناو. قەڵادار؛ دژبان ☜ دژبان

**دژون**[1] / d(i)jun/: ☜ **دژمان**

**دژون**[2]: ئاوەڵناو. چلکن؛ گەمار؛ کۆتی ☜ کثیف

**دژوێن**[1] / dijwên/: ☜ **دژمان**

**دژوێن**[2]: ئاوەڵناو. ١. چلکن ‹شمەک چلکن و ئەندام دژوێنی/ لە کۆی شیو دەکەی تێدەوەشێنی «هەژار، *ئاڵەکۆک*»› ٢. ئەسپێون ☜ ١. چرکین ٢. شپشو

**دژوون** / d(i)jûn/: ☜ **دژمان**

**دژووندەر** / d(i)jûnder/: ئاوەڵناو. دەڤچێڕ؛ جوێنفرۆش ☜ بددهن

**دژووین** / d(i)jûyn/: ☜ **دژمان**

**دژە** -/ d(i)je-/: پێشوشە. دژ؛ لا؛ پێچەوانە ‹دژەبا؛ دژەدین› ☜ مخالف

**دژەبا** / d(i)jeba/: ناو. بای ناساز ‹دژەبایە شەن ناکرێ› ☜ باد مخالف

**دژەچلک** / d(i)jeçiłk/: ناو. چلکبەر؛ چلک وشککەر ☜ آنتیبیوتیک

**دژهۆنی** / dijhonî/: ناو. کاری کۆ کردنەوەی دوو پێچەوانە لە هەڵبەستێکدا ☜ صنعت تضاد در شعر

**دژهێم** / dijhêm/: ئاوەڵناو. نارەسەن؛ نانەجیب ☜ بدگوهر

**دژی** / d(i)jî/: ناو. ١. ☜ **دژایەتی** ٢. نەخۆشییەکی ئاژاڵ ☜ ١. ☜ **دژایەتی** ٢. از بیماری‌های دام

**دژیا** / dijya/: ئاوەڵناو. سەرقژن؛ قژن؛ مووی سەری تێکەڵ-پێکەڵ ☜ آشفته‌موی

**دژیای** / dijyay/: چاوگ. گرژ بوون ☜ اخمو بودن

**دژیەک** / dijyek/: ئاوەڵناو. دژواز؛ ناتەبا ☜ مُتضاد

**دژێتی** / dijêtî/: ☜ **دژایەتی**

**دژێن** / d(i)jên/: ناو. لوو؛ گرێی گۆشت ☜ غُدّە

**دس** / dis/: ناو. شیلەی ترێی کوڵاو ☜ شیرەی انگور

**دست** / dist/: ناو. مەنجەڵ؛ بەرۆش ☜ دیگ

**دسەردە** / diserde/: ئاوەڵکار. دەسبەجێ؛ هەرلەجێ ☜ فوراً

**دسەرڕە** / diseře/: سارستە. ١. سەرەڕای؛ بەم حاڵەش ٢. لە لای سەرەوە ٣. لە سەرەتاوە ☜ ١. با وجود این ٢. از بالا ٣. از اول

**دش**[1] / diş/: ناو. دوش؛ باجی؛ خوشکی شوو ☜ خواهرشوهر

**دش**[2]: ☜ **دژ**[2]

◘ **دش کردن**: خۆ پارازتن 🇮🇷 پرهیز کردن

**دشپۆکە / dişpoke/**: ناو. وردە زیپکە و قنچکە لە سەر پێست 🇮🇷 جوش پوست

**دشت / dişt/**: ئاوەڵناو. دشتە؛ ناشیرین؛ دزێو؛ ناحەز 🇮🇷 زشت

**دشتە[١] / dişte/**: ناو. ناشیرینی؛ ناحەزی 🇮🇷 زشتی

**دشتە[٢]**: ☜ دشت

**دشتی / diştî/**: ناو. ١. کاری نالەبار ٢. ناحەزی؛ ناشیرینی 🇮🇷 ١. کار زشت ٢. زشتی

**دشمان / dişman/**: ☜ دژمان

**دشمن / dişmin/**: ☜ دوژمن

**دشمنی / dişm(i)nî/**: ☜ دوژمنی

**دشنە / dişne/**: ناو. خەنجەری دەمڕاست 🇮🇷 دشنە

**دشوار / dişwar/**: ☜ دژوار

**دشواری / dişwarî/**: ☜ دژواری

**دشە / dişe/**: ناو. جێگەی خراو 🇮🇷 جای بد

**دشی / dişî/**: ناو. ناحەزی؛ ناشیرینی 🇮🇷 زشتی

**دغە / diğe/**: ناو. گزی؛ فێڵ؛ گەڕ 🇮🇷 حیلە

**دفرە[١] / difre/**: ناو. نەخۆشییەکی یەکسمکوژە 🇮🇷 نوعی بیماری کُشندەی دام

**دفرە[٢]**: ئاوەڵناو. لەخۆبایی؛ تڕزل 🇮🇷 مغرور

**دفس / difs/**: ناو. دمس؛ دۆشاوی ترێ 🇮🇷 شیرەی انگور

**دفلۆک / diflok/**: ناو. ١. شاڵ و ملپێچی مەلایان ٢. فانیلە؛ ژێرکراس 🇮🇷 ١. شال گردن مُلایان ٢. زیرپیراهن

**دفن / difn/**: ناو. لووت؛ کەپۆ؛ کەپ؛ بێفل؛ تفنک 🇮🇷 بینی

**دفنان / difnan/**: چاوگ. خێر کردن بۆ مردوو؛ هەقی کفن و گۆڕهەڵکەن بۆ دان 🇮🇷 پول گور و کفن و دفن مُردە را دادن

**دفنبەران / difnberan/**: ئاوەڵناو. *[پلار]* قەپۆزبەران؛ لووتبەرز 🇮🇷 مغرور

**دڤ / div/**: ناو. ١. دەم؛ زار ٢. *[مەجاز]* زمان؛ زوان 🇮🇷 ١. دهان ٢. زبان

**دڤانەک / d(i)vanek/**: ناو. ڕەسید؛ پسوولە 🇮🇷 قبض؛ رسید

**دڤری / divrî/**: ناو. ١. گیایەکە ٢. تەوەرەی ئاش 🇮🇷 ١. گیاهی است ٢. قطب آسیاب

**دڤمری / divm(i)rî/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* شەرمێون لە قسە کردندا 🇮🇷 خجالتی در حرف زدن

**دڤن / divn/**: ناو. لووت؛ کەپۆ 🇮🇷 بینی

**دڤنەرم / divnerm/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دەموراوێژخۆش؛ قسەخۆش؛ خوەشقسە 🇮🇷 شیرینسخن

**دڤە / d(i)ve/**: ناو. ڕاستەی بەنا 🇮🇷 تراز

**دڤەدڤ / d(i)vediv/**: دەنگەناو. گژەگژی با؛ دەنگی بای توند 🇮🇷 صدای تُندباد

**دڤیچە / d(i)vîçe/**: ناو. دڤیچێ؛ چۆق؛ لەرز 🇮🇷 لرز

**دڤیچێ / d(i)vîçê/**: ☜ دڤیچە

**دڤێ / d(i)vê/**: ئاوەڵکار. دڤێت؛ ئەشێ؛ دەبێ؛ پێویستە 🇮🇷 باید

**دڤێت[١] / d(i)vêt/**: ناو. دەوات 🇮🇷 دوات

**دڤێت[٢]**: ☜ دڤێ

**دڤێر / d(i)vêr/**: ☜ دیوار-١

**دڤێک / d(i)vêk/**: ئاوەڵناو. پێویست 🇮🇷 بایستە

**دڤێل / d(i)vêl/**: ناو. باریکە زوێڵی چەرم 🇮🇷 نوار چرمی

**دک[١] / dik/**: ناو. سەکۆ 🇮🇷 سکو

**دک[٢]**: دەنگەناو. تک؛ دەنگی دڵۆپە 🇮🇷 صدای چکّە

**دکان / d(i)kan/**: ☜ دوکان

**دکتۆر / diktor/**: ☜ دوکتور

**دکتۆرا / diktora/**: ☜ دوکتورا

**دکتۆری / diktorî/**: ☜ دوکتوری

**دکتۆرین / diktorîn/**: ☜ دوکتورین

**دکراندن / dikrandin/**: چاوگ. ڕێز گرتن 🇮🇷 احترام

گذاشتن

**دکمه** / dikme/: ☜ **دوگمه**

**دکن** / dikin/: ناوەڵناو. دکین؛ چڵکەسوو؛ چڵکنی وا کە بە هیچ شوشتنێ پاک نەبێتەوە ☰ چرکمُردە

**دکە** / d(i)ke/: ناو. ١. دک؛ سەکۆ ٢. دڵۆپە؛ تکە ☰ ١. سکو ٢. چکە

**دکین** / dikîn/: ☜ **دکن**

**دگان** / digan/: ☜ **ددان**

**دگاوێدا** / digawêda/: ناوەڵکار. دەسبەجێ؛ لەجێ ☰ فوراً

**دگدگ** / digdig/: ناو. پاتۆڵی ڕەشی سوارکار و شەڕکەر ☰ شلوار مشکی سوارکار و جنگجو

**دگدگە** / digdige/: ناو. ١. نووکی مەزرەقی کول کە لە سووڕاندا ناوەستێ ٢. تمتمەی مەزرەق ٣. باپشکێو؛ چیچکەسلاو ☰ ١. نوک کند گردنا ٢. نوک آهنین گردنا ٣. گُل‌مُژە

**دگلدگانە** / digildigane/: دەنگەناو. دگل‌دگل؛ وشەی هاندانی کەڵەباب لە شەڕدا ☰ کلمەی تحریک خروس جنگی

**دگلدگل** / digildigil/: ☜ **دگلدگانە**

**دگمە** / digme/: ناو. دوگمە؛ قوپچە؛ پشکوژ ☰ دُکمە

**دگنای** / dignay/: چاوگ. خوتە و بۆڵە کردن ☰ غرولند کردن

**دگەر** / d(i)ger/: ناوەڵناو. بێگانە بە ماڵ و خێزان ☰ نامحرم

**دگەل** / d(i)gel/: ئامراز. پێڕا؛ ڕەگەڵ ☰ همراه با

**دل** / dil/: ☜ **دڵ**

▣ **دل ناڤ دان:** ☜ **دڵ ناو دان**

**دل بڕژین:** ئەڤیندار بوون؛ دڵ لێچوون ‹دلێ من بژیە زمانێ کوردی› ☰ عاشق شدن

**دل زڤڕین:** دڵ پێکاهاتن؛ دڵ تێکەڵاتن ☰ دل به هم خوردن

**دل ژێچوون:** لە بەر دڵ کەوتن ☰ رنجیدن

**دل شەوتین:** دڵ سووتان ☰ دل سوختن

**دل شەوشاندن:** دڵ پەرێشان کردن ☰ دل بە تشویش انداختن

**دل کازین:** دڵ تێکەڵاتن ☰ حال به هم خوردن

**دل کرن:** خواستن؛ گەرەک بوون ☰ خواستن

**دل گواشتن:** *[مەجاز]* دڵ گووشان ☰ دل فشردن

**دل مان:** دل ماین؛ دڵ شکان؛ ڕەنجان؛ دڵ مان ☰ رنجیدن

**دل ماین:** ☜ **دل مان**

**دل هشتن:** ڕەنجاندن؛ دڵ ئێشاندن ☰ رنجاندن

**دل هێلان:** دڵ شکاندن ‹ئەز نزانم ژ چ دلێ تە هێلابت› ☰ دل شکستن

**دلاخێڤ** / d(i)laxêv/: ناو. قات‌وقڕی ☰ قحطی

**دلاسان** / d(i)lasan/: ناوەڵناو. خاترجەم؛ ئارخەیان ☰ مُطمئن

**دلاڤین** / d(i)lavîn/: ناو. ناوەڕاستی بەهار و هاوین ☰ آخر بهار و اول تابستان

**دلام** / d(i)lam/: ناو. زەرگ؛ خشت؛ ڕمب ☰ زوبین

**دلاوەر** / d(i)lawer/: ناوەڵناو. ئازا؛ ڕەشید؛ عەگید؛ بوێر ☰ دلاور

**دلبجی** / dilbicî/: ناوەڵناو. دڵنیا؛ دڵهێسا؛ بێ‌خەم؛ دوور لە نیگەرانی ☰ خاطرجمع

**دلبژۆک** / dilbijok/: ناوەڵناو. ١. دڵ بەتاسە؛ ئارەزووکەر ٢. چنۆک؛ چاوچنۆک؛ چاڤ‌چنۆک؛ چاونەزێر؛ چاوبرسی؛ چاڤبرسی؛ چڵماس؛ چەڵماس ☰ ١. آرزومند ٢. حریص

**دلبکول** / dilbikul/: ناوەڵناو. دڵ بەکوڵ؛ خەفەتبار ☰ غمگین

**دلبەر** / dilber/: ☜ **دڵبەر**

**دلبی** / dilbî/: ناو. جۆرێ هەنجیر ☰ نوعی انجیر

**دلپارسەک** / dilparsek/: ناو. تۆلاز؛ ژنباز ☰ زن‌باز

**دلچیچک** / dilçîçik/: ناوەڵناو. ترسەنۆک؛ کەلەزات

🇮🇷 ترسو؛ بُزدل

**دلخار** / dilxar/: ئاوەڵناو. دلخوار؛ دڵڕەش 🇮🇷 بدنهاد

**دلخاز** / dilxaz/: ☜ **دڵخواز**

**دلخوار** / dilx(i)war/: ☜ **دلخار**

**دلخورد** / dilxurd/: ☜ **دڵخورت**

**دلخون** / dilxûn/: ئاوەڵناو. زۆر خەمین 🇮🇷 بسیار غمگین

**دلخەراب** / dilxerab/: ئاوەڵناو. دڕدۆنگ؛ بەگومان؛ ناخاترجەم 🇮🇷 دودل

**دلدار** / dildar/: ☜ **دڵدار**

**دلدایی** / dildayî/: ☜ **دڵبەر**

**دلزراڤ** / dilz(i)rav/: ئاوەڵناو. ترسەنۆک؛ کەمزات 🇮🇷 ترسو

**دلزەخم** / dilzexm/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دڵ گەورە؛ ئازا؛ نەترس 🇮🇷 بادلوجُرأت

**دلزیندی** / dilzîndî/: ☜ **دڵزیندو**

**دلسار** / dilsar/: ☜ **دڵسارد**

**دلساف** / dilsaf/: ☜ **دڵپاك**

**دلستور** / dils(i)tûr/: ئاوەڵناو. ئازا؛ بوێر 🇮🇷 شُجاع

**دلسۆژ** / dilsoj/: ☜ **دڵسۆز**

**دلشا** / dilşa/: ☜ **دڵشاد**

**دلشاد** / dilşad/: ☜ **دڵشاد**

**دلشاکەر** / dilşaker/: ئاوەڵناو. کەیفدەر؛ دڵخۆشیهێن 🇮🇷 شادیبخش

**دلشەوات** / dilşewat/: ئاوەڵناو. دلشەواتی؛ دلشەوتی؛ دڵسووتاو 🇮🇷 دلسوخته

**دلشەواتی** / dilşewatî/: ☜ **دلشەوات**

**دلشەوتی** / dilşewtî/: ☜ **دلشەوات**

**دلغەلینەک** / dilğelînek/: ناو. ڕشانەوە 🇮🇷 استفراغ

**دلفراوان** / dilf(i)rawan/: ☜ **دڵفراوان**

**دلفرەه** / dilf(i)reh/: ئاوەڵناو. دڵاوا 🇮🇷 بخشنده

**دلڤال** / dilval/: ☜ **دلڤەکری**

**دلڤەرا** / dilvera/: ئاوەڵناو. بەرزەمژی؛ بەرزەمژ؛ خاوەن هەست و بیری بەرز 🇮🇷 بُلندنظر

**دلڤەرسیای** / dilversyay/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* مێشکوشک؛ تێنەگەیشتوو 🇮🇷 خشکمغز

**دلڤەکری** / dilvek(i)rî/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دلڤال؛ دلاوا؛ بەخشندە؛ دەستڤەکری 🇮🇷 بخشنده

**دلڤەکەر** / dilveker/: ئاوەڵناو. دڵگوشا؛ شادیهێن 🇮🇷 شادیآور

**دلق** / dilq/: ☜ **دلیق**

**دلقایم** / dilqayim/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* بەوەرە؛ ئەرخەیان؛ پشتگەرم 🇮🇷 آسوده

**دلقی** / dilqî/: ناو. نەستەرەن؛ شیلان؛ گوڵەشیلان 🇮🇷 نسترن

**دلکول** / dilkul/: ☜ **دلکولین**

**دلکولین** / dilkulîn/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دلکول؛ دڵبریندار؛ خەمبار ‹غەفلەت مە دی لەو خەجلین/ مەحرووم و مەهجوور دلکولین «مەلای جزیری»› 🇮🇷 غمگین

**دلکەتی** / dilketî/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دڵدار؛ ئەڤیندار 🇮🇷 عاشق

**دلگرس** / dilgirs/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دڵگوشاد و مێرخاس 🇮🇷 پُردل

**دلگەش** / dilgeş/: ئاوەڵناو. دڵخۆش؛ بە هومێد 🇮🇷 امیدوار

**دلهوت** / dilĥut/: ناو. کوڕەدار؛ تێلەکە پووشکە 🇮🇷 وادیج؛ داربست تاک

**دلمای** / dilmay/: ئاوەڵناو. ڕەنجاو؛ دڵشکاو 🇮🇷 رنجیده

**دلمج** / dilmic/: ناو. بازنەی شووشە 🇮🇷 النگوی شیشەای

**دلمری** / dilm(i)rî/: ☜ **دڵمردو**

**دلمە** / dilme/: ☜ **دەڵمە**

**دلنزم** / dilnizm/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ١. نامەرد؛ پەست ٢. ڕژد؛ چرووک ٣. خاکەڕا؛ خاکەسار 🇮🇷

١. نامرد ٢. خسیس ٣. فروتن
**دلوپ** / d(i)lup/: ☜ **دڵۆپ**
**دلۆ** / d(i)lo/: سارستە. ئەی دڵ ☳ دلا
**دلۆپ** / d(i)lop/: ☜ **دڵۆپ**
**دلۆپین** / d(i)lopîn/: چاوگ. تکە کـردن؛ دڵـۆپە کردن. هەروەها: **دلۆپاندن** ☳ چکیدن
**دلۆدین** / d(i)lodîn/: ناوەڵناو. ١. دارماڵ؛ پڕ؛ تـژی؛ لیپاولیپ ٢. دڵەودوا؛ دوودڵ ☳ ١. سرشار ٢. دودل
**دلۆرە** / d(i)lore/: ناو. کار و ڕەوتی ڕاکشان؛ ڕازان؛ درێژ بوون؛ پاڵ کەفتن ☳ عمل دراز کشیدن
**دلۆف** / d(i)lof/: ناو. وەنەوز ☳ چُرت
**دلۆڤان** / d(i)lovan/: ناوەڵناو. دڵـنەرم؛ دڵ‌تـەنک؛ میهرەبان؛ میهرەوان؛ خاوەن بەزەیی و دڵـنەرمی ‹وە ناو خودا کە دەهندە و دلۆڤانە «هەژار، *قورئان*»›. هەروەها: **دلۆڤانی** ☳ مهربان
**دلۆق** / d(i)loq/: ناو. بلۆق ☳ تاول
**دلـو** / d(i)lû/: ناو. بانەگا؛ بەرگـەدە؛ ئـەو بەشـەی لەش کە کەوتۆتـە سـەر ئێسـکی ژێـر زگـەوە ☳ شرمگاه؛ زهار
**دلە ـ دلـە** / d(i)le d(i)le/: نـاو. دڵـنەوایی؛ کـاری دڵدانەوە ☳ دلنوازی
**دلها** / dilha/: ☜ **دڵخواز**
**دلهان** / dilhan/: ناوەڵناو. کەژ؛ مووسپی ☳ زال
**دلهایی** / dilhayî/: ☜ **دڵخوازی**
**دلهلـو** / dilh(i)lû/: ناوەڵـناو. دڵـــنەرم؛ خـــاوەن بەزەیی ☳ دل‌رحم
**دلهین** / dilhîn/: ناوەڵناو. ئارام؛ هێور ☳ آرام
⊡ **دلهین بوون**: ئارام بوون؛ سوکنایی هـاتن ‹هـەتا ئەز تۆ لا بابێ خوە وە نەکەم، دلێ من هـین نابـە› ☳ آرام شدن
**دلهێسا** / dilhêsa/: ☜ **دل‌بجی**
**دلیان** / dilyan/: ☜ **دڵخواز**
**دلیق** / d(i)lîq/: ☜ **دلێق**

**دلیوان** / d(i)lîwan/: ناو. دیلوان؛ تەبەنـە؛ تەوەنـە؛ دەرزی لێفە دروون ☳ سوزن لحافدوزی
**دلێ** / d(i)lê/: ئامراز. لە ناو ☳ توی
**دلێ ـ دلێ** / d(i)lê d(i)lê/: نـاو. دوودڵی؛ دڕدۆنگی ☳ دودلی؛ تردید
**دلێر** / d(i)lêr/: ناوەڵناو. ئازا؛ عەگید ☳ دلیر
**دلێرانە** / d(i)lêrane/: ناوەڵکار. ئازایانە؛ بوێرانـە ☳ شُجاعانه
**دلێق** / d(i)lêq/: ناو. دلق؛ دلیق؛ شـیلان؛ جلـێق: ١. ناوی دارچکێکی گەڵا پێنج یـا حـەوت‌پـەڕی گوڵ‌تاک یان کۆیە ٢. گوڵی ئەو دارچکە کـە بـە ڕەنگی سپی و ئاماڵ‌سوورە و لە گوڵـی ڕۆز دەکـا بەڵام گچکەتر و کەم‌پەڕترە ☳ ١و٢. نسترن کوهی
**دڵ**[١] / diɫ/: نـاو. دل: ١. قـەلب؛ ئەنـدامی هلۆڵـی ماسوولکەیی لەشی زۆرینەی گیانەوەران کـە بـە پشـکووتن و وێکهـاتنی (زۆرتـر) یـەک‌جـۆر و پەیتاـپـەیتا، خـوێن دەگەیێنێتـە لەشـەوە ٢. *[سەرزارەکی]* لەمـە؛ سـک؛ زگ؛ زک ‹سـەر دڵـم قورسە؛ دڵی کار ناکا› ٣. *[مەجاز]* جەرگە؛ ناو؛ نێـو؛ ناخ؛ ناوەند؛ دلێ؛ چۆنگ؛ چەق یان ناوەڕاسی هەر شتێک ‹لە دڵی شـەودا› ٤. *[مەجاز]* ئـەو بەشـەی زەین کە پێوەندی لەگەڵ عاتیفـە و هەسـتدایە: *الف)* ئەوین؛ میهر؛ دۆستایەتی ‹دڵ بردن؛ بە دڵەوە نیشـتن› *ب)* جـەرگ؛ ئازایـەتی؛ زات؛ بـوێری *ج)* هۆگرەتی ‹دڵ بە کارێک خـۆش کـردن› *د)* ڕادەی هەستیاری (لە بەرانبەر ڕەنج و خەمی کەسانی‌ترەوە) ‹دڵ‌ناسک› *هـ)* بیر و هۆش ‹بەر دەرگاکەتان کەپر و ساباتە/ ساڵ دوانزەمانگە دڵم لە لاتە «فولکلـۆر»› ٥. نادیارترینی هەست‌ونەسـتان ‹لـە دڵـی کەسـێک ئاگـادار بـوون› ٦. یـەکێک لـە چـوار نەخشـی وەرەق‌بازی، لە پاڵ خاچ و خشت و پیک ☳ ١تا٦ دل
⊡ **بە دڵ و گیان**: لە دڵەوە؛ بە ڕاستی و بە هـەموو

هەستەوە ‹بە دڵ و گیان یارمەتیت دەدەم› ☰ از دل و جان

**لە دڵەوە:** ۱. *[کینایە]* لە دڵا؛ لای خۆوە؛ لەگەڵ خۆدا ‹لە دڵەوە تووکی دەکرد› ۲. ☜ **بە دڵ و گیان** ☰ ۱. پیش خود ۲. ☜ **بە دڵ و گیان**

**لە ناخی دڵەوە:** *[کینایە]* لە کانگای دڵەوە؛ پڕبەدڵ ‹لە ناخی دڵەوە داوای خۆشبەختیم بۆ کرد› ☰ از تە دل

▣ **دڵ ئاو نەخواردنەوە:** *[مەجاز]* خاترجەم نەبوون؛ بێبڕوا بوون ☰ اطمینان خاطر نداشتن

**دڵ ئاو دان:** *[مەجاز]* دڵ ئاڤ دان؛ دڵ خۆش کردن؛ مژدەی خۆش پێ دان ☰ دلشاد کردن

**دڵ ئاوێنەی دڵ بوون:** *[مەجاز]* دڵ لە دڵ ئاگەنە بوون؛ میهرەبانی و دۆستایەتی لە دوو لایەنەوە بوون ‹منیش تۆم خۆش دەوێ، دڵ ئاوێنەی دڵە› ☰ دل بە دل راه داشتن

**دڵ ئێشان:** *[کینایە]* عاجز بوون؛ تووڕە بوون ☰ دلخور شدن

**دڵ بردن:** ۱. *[کینایە]* ئارەزوو کردن؛ واز لێ بوون ۲. *[مەجاز]* دڵ بەرەو خۆ کێشان؛ ئەویندار خۆ کردن ‹وتی ئەحمەد ئەگەرچی پیری تۆ هێشتاکە شاگردی/ تەماشا کە چلۆن بردم دڵی زارت بە ئوستادی «ئەحمەد موختار بەگ»› ☰ ۱. اشتها داشتن ۲. دل بُردن

**دڵ بوورین:** *[کینایە]* لە هۆش چوون؛ بێهۆش بوون ☰ از حال رفتن؛ بیهوش شدن

**دڵ بەجێ هێنان:** *[کینایە]* ڕازی کردن ☰ دلداری دادن؛ راضی کردن

**دڵ بەرایی نەدان:** *[کینایە]* دڵ بڕوایی نەدان؛ دڵ ڕازی نەبوون ☰ دل راه ندادن

**دڵ بەستن:** *[مەجاز]* ئەڤیندار بوون؛ عاشق بوون ☰ عاشق شدن

**دڵ بە سێڵەوە دان:** ☜ **دڵ بە کوچکەوە دان**

**دڵ بە قسەی کەسێک دان:** *[مەجاز]* هاودڵی لەگەڵ کەسێک کردن ‹زۆر دڵ مەدە بە قسەکانی، ڕاست و درۆی خوایزانێ!› ☰ دل بە دل کسی دادن

**دڵ بە کوچکەوە دان:** *[مەجاز]* دڵ بە سێڵەوە دان؛ داخ لە سەر دڵ دانان؛ دڵ سووتاندن ☰ داغ بە دل گذاشتن

**دڵ بە یەکا هاتن:** ☜ **دڵ هەڵشێوان**

**دڵبەیان:** قێز لە خواردن هاتنەوە؛ پێ نەخوران ☰ دل را زدن (خوراک)

**دڵ پڕ بوون:** *[مەجاز]* ۱. زۆر ڕەنجاو بوون ‹چت کردووە وا دڵی لێت پڕە؟› ۲. خەم داگرتن و گریان بۆ هاتن ☰ ۱و۲. دل پُری داشتن

**دڵ پیاچوون:** *[مەجاز]* ۱. ئارەزوو کردن ۲. دڵ چەقینە سەر شتێ؛ پەسند کردن ☰ ۱. آرزو کردن ۲. پسندیدن

**دڵ (لێ) پیس کردن:** *[مەجاز]* گومانی خراپ کردن؛ شک کردن ☰ بدگمان شدن

**دڵ پێ دان:** *[کینایە]* ۱. حەز لێکردن ‹کە ڕۆژی ئەوەڵ ئەمە حالت بوو/ بۆ دڵت پێدام، کێ زۆردارت بوو؟! «فولکلۆر»› ۲. گوێ پێ دان ‹دڵ بدە بە کار› ☰ ۱. دوست داشتن ۲. توجه کردن

**دڵ پێ سووتان:** *[مەجاز]* بەزە پێدا هاتن ‹دڵم پێسووتا و لە قەرزەکەی خۆش بووم› ☰ مورد ترحم قرار دادن

**دڵ پێکاهاتن:** ☜ **دڵ هەڵشێوان**

**دڵ پێوە بوون:** *[کینایە]* ۱. ئیشتیا کردن ۲. ئەویندار بوون ۳. گەرەک بوون ☰ ۱. اشتها کردن ۲. عاشق شدن ۳. خواستن؛ دوست داشتن

**دڵ توقین:** *[مەجاز]* دڵ ترەکیان؛ زۆر ترسان ☰ زهرەترک شدن

**دڵ تەزین:** *[کینایە]* دڵ سست بوون؛ خاو بوونەوە ☰ دل سست شدن

**دڵ تێچوون:** *[کینایە]* دڵ پێوە بوون ☰ اشتها کردن

**دڵ تێکچوون:** ☜ **دڵ هەڵشێوان**

**دڵ تێکهاڵان:** ☜ **دڵ هەڵشێوان**

**دڵ تێکەلاتن:** ☜ **دڵ هەڵشێوان**

**دڵ چوون:** بوورینەوە ☰ غش کردن

**دڵ چوونە سەر:** *[کینایە]* ١. ئارەزوو کردن؛ ئیشتیا لێبوون ٢. خۆش ویستن ☰ ١. اشتها کردن ٢. دوست داشتن

**دڵ چەراندن:** *[کینایە]* خۆش ڕابواردن؛ بە کەیفی خۆ کاریێ کردن ☰ خوش گذراندن؛ دل از عزا در آوردن

**دڵ چەقینە سەر شتێ:** ☜ **دڵ پیاچوون ـ٢**

**دڵ خاو بوونەوە:** *[کینایە]* دڵ بوورانەوە ☰ ضعف کردن

**دڵ خۆش کردن:** *[کینایە]* هیوادار بوون (زیاتر لەخۆڕا) ☰ أُمید داشتن (بیشتر واهی)

**دڵ داخورپیان:** دڵ داخورپیان؛ دڵ داکەوتن/ داکەفتن؛ دڵ شلەژان؛ دڵ ڕاچەنین ☰ یکە خوردن

**دڵ داخورپیان:** ☜ **دڵ داخورپان**

**دڵ داکەوتن/ داکەفتن:** ☜ **دڵ داخورپان**

**دڵ داگیران:** *[کینایە]* دڵ گیران؛ تووشی خەم و دلتەنگی بوون ☰ دل گرفتن

**دڵ دان:** *[کینایە]* حەز لێکردن؛ دلداری کردن ☰ عاشق شدن

**دڵ دانە کار:** *[مەجاز]* شان بۆ کارێک شل کردن ‹ئەگەر دڵ بدەیتە کار، زوو فێری دەبی› ☰ دل به کاری دادن

**دڵ دانە کەسێک:** *[کینایە]* ئەویندارى کەسێک بوون ‹دڵم دایە تۆ کە یارم بی› ☰ دل بە کسی دادن

**دڵ دانەوە:** *[کینایە]* دڵجۆیی کردن ☰ دلنوازی کردن

**دڵ دەرچوون:** *[مەجاز]* دڵ دەرهاتن ‹بۆ تووتنەکەی (پێشەمە) و (شاور) و (شێتنە)/ شێت بووم و نەهات، وەختە دڵم دەرچێ لە داغا «شێخ ڕەزا»› ☰ دل آب شدن

**دڵ دەرهاتن:** *[مەجاز]* لە بەر ویستنی شتێک، ئارام و قەرار نەمان ☰ دل آب شدن

**دڵ ڕابوون:** *[کینایە]* دڵ ڕابین؛ ڕشانەوە ☰ قی کردن

**دڵ ڕابین:** ☜ **دڵ ڕابوون**

**دڵ ڕاچەنین:** *[کینایە]* دڵ بۆ شتێ لێدان؛ هەوای شتێ کردن ‹بۆ منیش ملکی بەهەشت پڕ بێ لە حۆر و بمدەنێ/ گەر دڵم بۆی ڕاچەنێ دووسەد کەرەت بێجا ئەکا «قانع»› ☰ خاطر گرفتن

**دڵ ڕاگرتن:** *[کینایە]* حورمەت گرتن؛ بە خۆشی دەگەڵ جووڵانەوە ☰ خاطر گرفتن

**دڵ ڕفاندن:** *[مەجاز]* ئەویندار کردن؛ دڵ دزین ☰ دل از کسی بردن

**دڵ ڕۆین:** *[مەجاز]* بێهۆش کەوتن؛ دڵ بوورینەوە ☰ بیهوش شدن

**دڵ ڕەنجاندن:** *[کینایە]* دڵ ئێشاندن؛ ئازار دان ☰ آزردن

**دڵ سارد بوونەوە:** *[مەجاز]* ناهمێ بوون؛ دەست بۆ کار نەچوون؛ بێحاڵ و حەوسەڵە بوون ‹دڵم لەو کارە سارد بووەوە، بەجێم هێشت›. هەروەها:

**دڵ سارد کردنەوە** ☰ دلسرد شدن

**دڵ سوار بوون:** دڵەودوا بوون ☰ دلواپس بودن

**دڵ سووتان:** *[مەجاز]* دڵ سووتیان؛ دڵ سووتیانەوە: ١. بەزە پێدا هاتنەوە ‹دڵی سووتا بە حاڵی زاری تیفلی دڵم و چاری کرد/ سەری زوڵفی لە دەم نا، زەهری ماری پڕ بە زاری کرد «مەحوی»› ٢. بەداخ و کەسەر بوون ☰ ١. ترحُم کردن ٢. حسرت خوردن

**دڵ سووتیان:** ☜ **دڵ سووتان**

**دڵ سوتیانەوە:** ☜ **دڵ سوتان**

**دڵ سەندن:** */مەجاز/* دڵ سەنن؛ دڵ لێ‌سەندن؛ دڵ لێ‌سەنن؛ دڵ بەرەو خۆ ڕاکێشان ☰ دل بُردن

**دڵ سەنن:** ☜ **دڵ سەندن**

**دڵ شکان:** دڵ شکیان؛ دڵ ڕەنجان ☰ رنجیدن

**دڵ شکاندن:** */مەجاز/* ناهومێد و ناکام کردن ‹بۆچی نەگریم سەد کەڕەتم دل دەشکێنی؟/ بۆ مەی نەڕژێ شووشە لە سەد لاوە شکاوە؟ «نالی»› ☰ دل شکستن

**دڵ شکیان:** ☜ **دڵ شکان**

**دڵ شێلان:** */مەجاز/* دڵ ڕەنجاندن ☰ رنجاندن

**دڵ قەبز بوون:** */مەجاز/* ١. خەمین بوون؛ نارەحەت بوون ٢. زگ وێستان؛ دڵ کار نەکردن ☰ ١. اندوهگین شدن ٢. یبوست داشتن

**دڵ کار نەکردن:** */کینایە/* زگ وێستان؛ دڵ قەبز بوون ☰ یبوست داشتن

**دڵ کرانەوە:** */مەجاز/* کەیفخۆش بوون؛ دەرباز بوون لە خەم و خەفەت ☰ دل باز شدن

**دڵ کورکان:** */مەجاز/* دڵ کورکە کردن؛ ئارەزوو کردنی شتێ ☰ دل لک زدن

**دڵ گیران:** */مەجاز/* دڵتەنگ بوون ☰ دلتنگ شدن

**دڵ لە بورەوە چوون:** */کینایە/* لە سەر خۆ چوون لە برسییەتی ☰ از حال رفتن از گرسنگی

**دڵ لە خۆ بونەوە:** */کینایە/* بوورانەوە؛ لەسەرخۆ چوون ☰ بیهوش شدن

**دڵ لە دڵ ئایەنە بون:** ☜ **دڵ ئاوێتەی دڵ بون**

**دڵ لە دڵ دان:** */کینایە/* دوودڵ بوون؛ خاترجەم نەبوون ☰ دودل بودن

**دڵ لە ژێللا هاتن:** */کینایە/* دڵ هەڵشێویان ☰ دل به هم خوردن

**دڵ لە مشتدا بون:** */مەجاز/* تووشی دڵەڕاوکێ و نیگەرانی بوون ‹دایم دلم لە مشتمدا بوو نەک بزانێ و ئابڕووم ببا› ☰ مُضطرب بودن

**دڵ لێچون:** */کینایە/* هۆگر و خوازیار بوون؛ دڵ چوونە سەر ‹یەکەم جار چاوم پێ کەوت، دلم لێی چوو› ☰ عاشق شدن

**دڵ لێ دان:** ١. زیندوو بوون ٢. */کینایە/* دڵ هەواڵ دان؛ ئاگا بوونی دڵ لە مەبەستێ ☰ ١. زنده بودن ٢. به دل برات شدن

**دڵ لێ‌سەندن:** ☜ **دڵ سەندن**

**دڵ لێ‌سەنن:** ☜ **دڵ سەندن**

**دڵ لێ کەندن:** */مەجاز/* لە شتێ چاو پۆشین و چیتر بە شوێنیدا نەچوون ☰ دندان طمع را کشیدن

**دڵ لێ‌هەڵکەفتن:** */مەجاز/* لە بەر چاو کەوتن؛ بێزار بوون ☰ دل (کسی) را زدن

**دڵ لێ‌هەڵکەوتن:** ☜ **دڵ هەڵکەوتن**

**دڵ مان:** */مەجاز/* ڕەنجان؛ دڵ ئێشان ☰ رنجیدن

**دڵ نەبردن:** */کینایە/* ئیشتیا لێ‌نەبوون ☰ میل نداشتن (به خوراک)

**دڵ وەستان:** کوت‌وپڕ مردن ☰ ناگهانی مُردن

**دڵ هاتن:** */مەجاز/* ڕازی بوون؛ ڕەزا دان (زۆرتر لە پرسیاری نەرێنیدا دەگوترێ) ‹دلت دێ بە جێی بێلی؟› ☰ دل (کسی) آمدن

**دڵ هاتنە کوڵ:** */مەجاز/* دڵ بوونە بریان؛ خەمین و نارەحەت بوون ‹بینینی ڕەنج و ئازاری ئاوارەکان دڵ دێنێتە کوڵ› ☰ دل به درد آمدن

**دڵ هاتنە یەکا:** ☜ **دڵ هەڵشێوان**

**دڵ هەڵشێوان:** */کینایە/* دڵ بە یەکا هاتن؛ دڵ پێکاهاتن؛ دڵ تێکچوون؛ دڵ تێکهالان؛ دڵ تێکەلاتن؛ دڵ هاتنە یەکا؛ دڵ هەڵشێویان؛ زێلە ڤەشیڤیەی ☰ دل به هم آمدن

**دڵ هەڵشێویان:** ☜ **دڵ هەڵشێوان**

**دڵ هەڵکەفتن:** ☜ **دڵ هەڵکەوتن**

**دڵ هەڵکەنران:** ☜ **دڵ هەڵکەوتن**

**دڵ هەڵکەنیان:** ☜ **دڵ هەڵکەوتن**

**دڵ هەڵکەوتن:** /مەجاز/ دڵ لێ‌هەڵکەوتن؛ دڵ هەڵکەفتن؛ دڵ هەڵکەنران؛ دڵ هەڵکەنیان؛ لە بەر چاو کەوتن ☰ از چشم افتادن

**دڵ هێنانەوە جێ:** /مەجاز/ دڵنەوایی کردن ☰ دلجویی کردن

**دڵی خۆ خۆش کردن:** /مەجاز/ لە خۆڕا بە هیوا بوون ☰ دل خود را صابون زدن

**دڵی شێر هەبوون:** /مەجاز/ زۆر ئازا و نەترس بوون ☰ دل شیر داشتن

**دڵی کەسێک بۆ کەسێک لێدان:** /کینایە/ بە بۆنەی کەسێکەوە ژیان ‹دڵم تەنیا بۆ تۆ لێدەدا› ☰ دل کسی برای کسی تپیدن

**دڵی کەسێک** (**بە/ لە**) **لای کەسێکەوە بوون:** /مەجاز/ ئەویندار و گیرۆدەی کەسێک بوون ‹دڵم لای تۆیە چیتر خاوەنی نیم!› ☰ دل پیش کسی باختن

**دڵی کەسێک** (**بە**) **هەزار لادا چوون:** /مەجاز/ بە بۆنەی نیگەرانییەوە بیری جۆراوجۆر کردنەوە ‹زۆر وە درەنگ کەوتی، دڵم هەزار لا چوو› ☰ دل کسی (به) هزار راه رفتن

**دڵی کەسێک نەرم کردن:** /مەجاز/ بە کردەوە و ئاکاری خۆ دڵی کەسێک بەرەو لای خۆ هێنان. هەروەها: **دڵی کەسێک نەرم بوون** ☰ دل کسی را به دست آوردن

**باو دڵ بوون:** /کینایە/ شیاوی حاڵ بوون؛ گونجاوی بارودۆخ بوون ☰ باب دندان بودن

**بەدڵ بوون:** /کینایە/ بەرامبەر بە داخواز بوون ☰ پسند بودن

**بە دڵا** (**دڵدا**) **لێوبان:** /مەجاز/ بە دڵ کەسێکدا هاتن؛ بە کەسێک سەرۆ بوون ☰ بە دل کسی برات شدن

**بە دڵی کەسێک کردن:** /کینایە/ بە خواست و ئاواتی کەسێک کردن ☰ مطابق میل کسی عمل کردن

**بە دڵی کەسێکەوە نیشتن:** /مەجاز/ بە کەیفی کەسێک بوون ‹قسەکانی بە دڵمەوە نیشت› ☰ به دل کسی نشستن

**گرتنە دڵ:** /مەجاز/ ڕەنجان؛ لە دڵدا کار کردن ‹ئەم قسانە مەگرە دڵ!› ☰ به دل گرفتن

**لە دڵدا کار کردن:** ☜ **گرتنە دڵ**

**لە دڵی کەسێک دان:** /مەجاز/ ١. بە کەسێک سەرۆ بوون ‹بەیانی دای لە دڵم، ئەمڕۆ دەتبینم!› ٢. دڵ ئێشاندن؛ کەسێک ڕەنجاندن ‹قسەکانی دای لە دڵم› ☰ ١. به دل کسی برات شدن ٢. کسی را رنجانیدن

**لە دڵی کەسێک دەرهێنان:** /مەجاز/ کەسێک ئاشت کردنەوە ‹کاکت لێم ڕەنجابوو، چووم لە دڵم دەرهێنا› ☰ از دل کسی درآوردن

**نیشتنە دڵەوە:** /مەجاز/ زۆر خۆش و دڵخواز بوون ☰ به دل نشستن

**دڵ ـ**[٢]: پێشوشە. لەگەڵ ئاوەڵناودا، ئاوەڵناوی لێکدراو دروست دەکا ‹دڵناسک؛ دڵڕەق› ☰ دل ـ

**ـ دڵ**[٢]: پاشوشە. ١. لەگەڵ ئاوەڵناودا، ئاوەڵناوی لێکدراو دروست دەکا ‹پاکدڵ؛ خۆشدڵ› ٢. لەگەڵ پێشگردا ئاوەڵناوی لێکدراو دروست دەکا ‹بەدڵ؛ بێ‌دڵ› ☰ ١و٢. ـ دل

**دڵئازا** / dił'aza/: ئاوەڵناو. /مەجاز/ دڵقایم؛ بەجەرگ ☰ دلیر

**دڵئاسوودە** / dił'asûde/: ئاوەڵناو. بێخەم؛ خاترجەم؛ ئارخەیان ☰ آسودەخاطر

**دڵئاوا** / dił'awa/: ئاوەڵناو. /مەجاز/ دەستبڵاو؛ بەخشندە ‹شەراب هەرچەندە تاڵوتوونە، چاوم/ کە ساقی وا دڵئاوا بێ چ خۆشە! «ئاوات»› ☰ بخشنده

**دڵئێشاو** / dił'êşaw/: ئاوەڵناو. دڵمەند ☰ دلخور

**دڵئێشە** / dił'êşe/: ناو. دڵێشە؛ ژانی دڵ؛ نەخۆشی دڵ ☰ دل‌درد

**دڵارا** / d(i)łara/: ئاوەڵناو. /مەجاز/ بەردڵ؛

دڵخۆشکەر ≡ دلگشا

**دڵارام** / d(i)łaram/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* دەلال: ١. دڵتەنا؛ ئارامی دڵ ٢. بەردڵ؛ زۆر خۆشەویست ‹عاشق دڵی نایێ لە دلارامی جودا بێ/ ئەڵبەت کە دڵ ئارامی لەوێ بێ، دڵی نایێ «نالی»› ≡ ١و٢. دلارام

**دڵازا** / d(i)łaza/: ئاوەڵناو. دڵقایم ≡ دلیر

**دڵازار** / d(i)łazar/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* هۆی ڕەنجاوی و دڵئێشاوی ≡ دل‌آزار

**دڵاسودە** / d(i)łasûde/: ئاوەڵناو. دڵنیا؛ خاترجەم؛ بێخەم ≡ آسودەدل

**دڵاوا** / d(i)ława/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* دەهەندە؛ بەخشندە؛ دەستفەکری؛ دەستکراوە؛ دەستودڵباز ≡ سخی؛ بخشندە

**دڵاوایی** / d(i)ławayî/: ناو. ئادا؛ سەخاوەت؛ نانبدەیی ≡ سخاوت

**دڵاودڵ** / d(i)ławdił/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* دوودڵ ≡ دودل

⊡ **دڵاودڵ بوون**: دوودڵ بوون؛ دڵنیا نەبوون ≡ تردید داشتن

**دڵاودڵ کردن**: *[کینایە]* دوودڵی کردن ≡ دودلی کردن

**دڵاوەدان** / d(i)ławedan/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* وریا؛ وشیار؛ بەهۆش ≡ هوشیار

**دڵاوەر** / d(i)ławer/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ١. دڵداریدەر؛ دڵخۆشیدەرەوە ٢. بوێر؛ ئازا؛ چاونەترس ≡ ١. دلنواز ٢. دلاور

**دڵباش** / diłbaş/: ئاوەڵناو. ڕاستبین؛ بیرڕاست ≡ راستبین

**دڵبرین** / diłb(i)rîn/: ☜ **دڵبریندار**

**دڵبریندار** / diłb(i)rîndar/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* دڵبرین؛ زۆر خەمبار ≡ بسیار غمگین

**دڵبزوێن** / diłbizwên/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* هەستبزوێن ≡ دل‌انگیز

**دڵبژۆک** / diłb(i)jok/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* ١. تامەزرۆ؛ موشتاق ٢. چاوچنۆک؛ تەماحکار. هەروەها: **دڵبژۆکی** ≡ ١. مُشتاق ٢. حریص

**دڵبوراو** / diłbûraw/: ئاوەڵناو. دڵبووراوە؛ بێهۆش ≡ بیهوش

**دڵبوراوە** / diłbûrawe/: ☜ **دڵ بوراو**

**دڵبەخەم** / diłbexem/: ئاوەڵناو. بەداخ؛ خەمین ≡ غمگین

**دڵبەدنیا** / diłbedinya/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* شاد بە ژیان ≡ دلخوش به زندگی

**دڵبەدوا** / diłbed(i)wa/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* ١. ناهومێد ٢. نیگەران ≡ ١. مأیوس ٢. نگران

**دڵبەر**[1] / diłber/: ناو. *[کینایە]* دلبەر؛ دڵوەر؛ دولبەر؛ دلدایی؛ دڵبەند؛ دڵدار؛ گراوی؛ کچ یان ژنێک کە دڵیان بۆ دەشنێت ≡ دلبر

**دڵبەر**[2]: ئاوەڵناو. *[کینایە]* دلبەر؛ دلدایی؛ دولبەر؛ دڵوەر؛ دلدایی؛ دڵبەند؛ دڵڕفێن؛ دڵفرێن؛ گراوی؛ خاوەن جوانی و دڵڕاکێشی ‹تۆ پی شیرینی جە پا تا وە سەر/ سەرتاپات دڵچەسپ، دڵکێش و دڵبەر «سەیدی»› ≡ دلبر

**دڵبەری** / diłberî/: ناو. دڵدزی؛ کار و ڕەوتی دڵ لە کەسێک بردن ≡ دلبری

**دڵبەستوو** / diłbestû/: ئاوەڵناو. پابەند؛ پێبەند؛ خووپێگرتوو ≡ مأنوس

**دڵبەستە** / diłbeste/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ١. بەتاسە ٢. گیرۆدە؛ ئەویندار ‹بە تەلیسمی حەبەشیزادەوە سەرگەردانم/ عاشقی خاڵم و دڵبەستەیی داوی کەمەری «وەفایی»› ≡ ١. آرزومند ٢. عاشق

**دڵبەستەیی** / diłbesteyî/: ناو. *[مەجاز]* گیرۆدەیی؛ واز؛ هەبوونی پێوەندی و لایەنگری لە ناخی دڵەوە ≡ دلبستگی

**دڵبەسۆ** / diłbeso/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دڵسووتاو ≡

دلسوخته

**دڵبەگەرداو / diłbegerdaw/**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* دڵبەخەم؛ خەمبار 🇮🇷 اندوهگین

**دڵبەند / diłbend/**: ☜ **دڵبەر**

**دڵبەهومێد / diłbehumêd/**: ☜ **هیوادار**

**دڵپارسەک / diłparsek/**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* سەوداسەر؛ خاوەن خوو یان هۆگری عاشقی ئەم و ئەو بوون 🇮🇷 عاشق‌پیشه

**دڵپاقژ / diłpaqij/**: ☜ **دڵپاك**

**دڵپاک / diłpak/**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* دڵپاقژ؛ دڵساف؛ بێ‌گزی؛ بێ‌فروفێڵ 🇮🇷 پاکدل

**دڵپاکی / diłpakî/**: ناو. سافی؛ ئیخلاس 🇮🇷 اخلاص

**دڵپڕ / diłpiř/**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* دڵتژی: ١. خەمبار ٢. تووڕە ٣. بێ‌ئیشتیا 🇮🇷 ١. غمگین ٢. عصبانی ٣. بی‌اشتها

**دڵپڕلەخەم / diłpiřxem/**: ئاوەڵناو. جەرگاوس؛ مەینەتبار 🇮🇷 اندوهگین

**دڵپڕی / diłp(i)řî/**: ناو. *[کینایە]* دڵتەنگی ‹بمهێنە دەر لە گێژوخولی چەرخی چەپڕەوت/ عاجز مەبە لە دڵپڕی ئەمن و لە زۆروەڕیم «ئاوات»› 🇮🇷 غم‌زدگی؛ اندوهباری

**دڵپەرت / diłpert/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دڵ پەرێشان؛ دڵ پەشێو؛ خەیاڵ‌بڵاو؛ ناخاترجەم. هەروەها: **دڵپەرتی** 🇮🇷 دل‌پریشان

**دڵپەرێشان / diłperêşan/**: ☜ **دڵپەرت**

**دڵپەرتی / diłpeřtî/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دڵسووتاو؛ زۆر ناڕەحەت و خەمبار 🇮🇷 دلسوخته

**دڵپەسند / diłpesind/**: ئاوەڵناو. خۆشەویست 🇮🇷 دلپسند

**دڵپەشێو / diłpeşêw/**: ☜ **دڵپەرت**

**دڵپەشێوی / diłpeşêwî/**: ناو. دڵەڕاوکێ؛ دڵخورتی 🇮🇷 اضطراب

**دڵپیس / diłpîs/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دڵ گەن: ١. بەدڕا؛ هەناڤ‌ڕەش ٢. خەڵێل؛ بیرخەراب؛ گومان‌ڕەش 🇮🇷 ١. بدنهاد ٢. بدگمان

**دڵپیسی / diłpîsî/**: ناو. *[مەجاز]* خەڵێڵە؛ بیرخراپی 🇮🇷 بدگمانی

**دڵپێچە / diłpêçe/**: ناو. *[کینایە]* ژان و بڕک؛ دڵ ئێشە 🇮🇷 دل‌پیچه

**دڵپێک / diłpêk/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دلگر؛ دڵبەر 🇮🇷 دلبر

**دڵتا / diłta/**: ناو. ١. نێوی چوارەمین پیتی ئەلفبای یوونانی ($\delta$, $\Delta$) ٢. *[ریازی]* نیشانەی بگۆڕێک ٣. *[ریازی]* نیشانەی دیاریکراوی موعادلەی دەرەجە دوو ٤. *[زەویناسی]* ناقروو؛ نێوان دوو ئاو؛ دەشتی ئاوماڵشتی وەک پەنجە کە لە ڕێژگەی ڕووباردا پێک‌دێ 🇮🇷 ١تا۴. دلتا

**دڵتژی / diłt(i)jî/**: ☜ **دڵپڕ**

**دڵتەڕ / diłteř/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ١. خاوەن عادەت یان هۆگری عیشقبازی ٢. تەڕپۆش؛ خۆشپۆش؛ بۆشناغ 🇮🇷 ١. عاشق‌پیشه ٢. شیک‌پوش

**دڵتەزێن / diłtezên/**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* دڵ سست‌کەر 🇮🇷 دلخراش

**دڵتەمری / diłtemrî/**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* دڵ وشک؛ مرومۆچ؛ وشک 🇮🇷 دلمُرده

**دڵتەنا / diłtena/**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* خاترجەم؛ ئارخەیان 🇮🇷 آسوده‌خاطر

**دڵتەنک / diłtenik/**: ئاوەڵناو. دلۆڤان؛ میهرەبان؛ خاوەن بەزەیی و دڵنەرمی 🇮🇷 مهربان

**دڵتەنگ / diłteng/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ١. دڵخەف؛ تاریک و ناخۆش ٢. خەمبار؛ خەفەتبار. هەروەها: **دڵتەنگی** 🇮🇷 ١و٢. دلتنگ

**دڵتێر / diłtêr/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* چاوتێر؛ بێ‌تەماح 🇮🇷 قانع

**دڵتێکچو / diłtêkçû/**: ئاوەڵناو. دڵ هەڵشێواو 🇮🇷 دل به هم آمده

**دڵجۆیی** / diłcoyî/: ناو. [مەجاز] کار و ڕەوتی لاواندنەوە؛ دڵدانەوە؛ ئاشت کردنەوە بە قسەی خۆش ☰ دلجویی

**دڵچڕ** / diłçiř/: ئاوەڵناو. [مەجاز] ١. ڕژد؛ چنۆک؛ چرووک ٢. تووش؛ بەدفەڕ؛ مەردمئازار ☰ ١. خسیس ٢. مردمآزار

**دڵچڕێن** / diłç(i)řên/: ئاوەڵناو. [مەجاز] دڵتەزێن ☰ دلخراش

**دڵچەپەڵ** / diłçepeł/: ئاوەڵناو. [مەجاز] ١. بیر و هزر خراپ؛ دڵپیس؛ دڵگەمار ٢. خانەگومان ☰ ١. بدنهاد ٢. بدگمان

**دڵچەڕێن** / diłçeřên/: ئاوەڵناو. [مەجاز] خۆشڕابوێر ☰ عیّاش

**دڵخاڵی** / diłxałî/: ناو. ناشتا؛ نەخری؛ دڵخاڵی ☰ ناشتا

**دڵخراپ** / diłx(i)rap/: ئاوەڵناو. بەدنیهاد؛ دڵپیس؛ بەدخوا ☰ بدنهاد

**دڵخوا** / diłx(i)wa/: ☜ **دڵخواز**

**دڵخواز** / diłx(i)waz/: ئاوەڵناو. [کینایە] دلخاز؛ دلها؛ دلیان؛ دڵخوا ☰ دلبخواه

**دڵخوازی** / diłx(i)wazî/: ناو. دلهایی: [کینایە] ١. ئارەزوو ٢. دڵداری ☰ ١. آرزو ٢. عشق

**دڵخور** / diłxur/: ☜ **دڵخورت**

**دڵخورت** / diłxurt/: ئاوەڵناو. [مەجاز] دلخورد؛ دلخور؛ نیگەران؛ دڵەودوا ☰ دلنگران

**دڵخورتی** / diłxurtî/: ناو. [مەجاز] دڵەخورپە؛ دڵەخورپێ؛ دڵەڕاوکێ؛ پەرۆشی؛ خرتوپرتی دڵ ☰ دلهره

**دڵخوشی** / diłxoşî/: ناو. شاوانی؛ شادومانی ☰ شادمانی

**دڵخوێن** / diłx(i)wên/: ئاوەڵناو. [مەجاز] دلخوون؛ زۆر خەمبار لە شتێ یان ڕووداوێک ☰ دلخون

**دڵخۆر** / diłxor/: ئاوەڵناو. [کینایە] ١. دڵتەنگ؛ دڵشکاو؛ خەمبار ٢. ڕەنجاو؛ دڵداماو. هەروەها: **دلخۆری** ☰ ١و٢. دلخور

**دڵخۆش** / diłxoş/: ئاوەڵناو. [کینایە] بەکەیف؛ شاد؛ دەماخچاخ ☰ شاد

▣ **دڵخۆش کردن**: [کینایە] ١. دڵشاد کردن؛ خۆشحاڵ کردن ٢. هیوای پڕوپووچ پێ دان ☰ ١. خوشحال کردن ٢. امید واهی دادن

**دڵخۆشکەر** / diłxoşker/: ئاوەڵناو. شادیبەخش؛ دلارا ☰ دلخوش‌کن

**دڵخۆشکەرە**[1] / diłxoşkere/: ناو. [کینایە] شتی بێبایەخ کە لە خۆڕا دەبێتە هۆی هیوا و خۆشحاڵی ‹ئەم قسانە تەنیا دڵخۆشکەرەن و بەس، دەنا گرفتەکان هەروا ماون› ☰ دل‌خوش‌کنک

**دڵخۆشکەرە**[2]: ئاوەڵناو. [کینایە] هۆی شادی ☰ شادی‌آور

**دڵخۆشی** / diłxoşî/: ناو. [کینایە] ١. شادی؛ بەکەیفی؛ بەدەماخی ٢. هیوا ☰ ١. شادی ٢. امید

▣ **دڵخۆشی دانەوە**: [کینایە] ١. لاواندنەوە؛ دڵجۆیی کردن ٢. هیوا پێ دان ☰ ١. دلجویی کردن ٢. امیدوار ساختن

**دڵخۆشیهێن** / diłxoşîhên/: ☜ **دڵشاکەر**

**دڵدادە** / diłdade/: ناو. عاشق؛ ئەویندار ☰ عاشق

**دڵدار**[1] / diłdar/: ناو. [کینایە] دلبەر؛ دلدار؛ ئەوەی ئەویندارى دەبن ‹داخیداخانم کە پیری هات و دلدارم نەهات› ☰ دلدار

**دڵدار**[2]: ئاوەڵناو. [کینایە] دلدار: ١. ئەویندار؛ عاشق ٢. ئازا؛ نەترس ☰ ١. عاشق ٢. دلیر

**دڵدارانە** / diłdarane/: ئاوەڵناو. عاشقانە؛ ئەویندارانە ☰ عاشقانه

**دڵداری** / diłdarî/: ناو. [کینایە] دلێنی: ١. ئەوین؛ ڤین؛ حەزلێکەری ‹ئەمەش لە دیدا کانیی ژنانە/ قیبلەی دڵداریی هەرزەکارانە «گۆران»› ٢. کاری دڵخۆشی دانەوە؛ لاواندنەوە ☰ ١. عشق ٢. دلنوازی

**دڵداکەوتوو** / diłdakewtû/: ئاوەڵناو. زاڵەترەک؛ زراوچوو؛ تووشیاری دڵەڕاوکێ و بیرئاڵۆزی زهرەترک

**دڵداگ** / diłdag/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* دڵکەتی؛ بەندەوار؛ ئەویندار دلدادە

**دڵدز** / diłdiz/: ناو. *[کینایە]* گراوی؛ ماشقە معشوقە

**دڵدزی** / diłd(i)zî/: ناو. *[کینایە]* ١. دڵبەری ٢. نهێنی دڵ ١. دلبری ٢. راز نهانی

**دڵدوێن** / diłd(i)wên/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* دڵداریدەر دلنواز

**دڵڕفێن** / diłř(i)fên/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دڵڕەڤێن؛ دلفرێن؛ دلبەر. هەروەها: **دڵڕفێنی** دلرُبا

**دڵڕوون** / diłřûn/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* ئارخەیان؛ بێگومان. هەروەها: **دڵڕوونی** آسودەخاطر

**دڵڕەحم** / diłřeĥm/: ☜ **دڵڕەحمین**

**دڵڕەحمین** / diłřeĥmîn/: ئاوەڵناو. دڵڕەحم؛ دلنەرم؛ بە بەزەیی دل‌رحم

**دڵڕەش** / diłřeş/: ☜ **دڵڕەق**

**دڵڕەڤین** / diłřevîn/: ☜ **دڵڕفێن**

**دڵڕەڤێن** / diłřevên/: ☜ **دڵڕفێن**

**دڵڕەق** / diłřeq/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دڵڕەش؛ دڵسەخت؛ بێبەزە. هەروەها: **دڵڕەقی** سنگدل

**دڵڕەنج** / diłrenc/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دڵشکاو رنجیدەخاطر

**دڵزیندوو** / diłzîndû/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* دڵزیندی؛ دلگەش؛ دڵاوەدان زندەدل

**دڵسارد** / diłsard/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* دلسار؛ دڵسەرد؛ ناهومێد دلسرد

**دڵساردی** / diłsardî/: ناو. *[کینایە]* ناهومێدی؛ دۆخ یان چۆنیەتی تەواسان و لە دەست دانی هۆگرەتی و هیوا دلسردی

**دڵساف** / diłsaf/: ☜ **دڵپاک**

**دڵسان** / diłsan/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* دەهندە؛ دڵاوا بخشندە

**دڵستوور** / diłs(i)tûr/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دڵشێر؛ بوێر؛ ئازا؛ بەجەرگ شُجاع

**دڵسستکەر** / diłsistker/: ئاوەڵناو. دڵتەزێن دلخراش

**دڵسوار** / diłs(i)war/: ☜ **دڵەدوا**

**دڵسوتی** / diłsotî/: ☜ **دڵسوتاو**

**دڵسۆز** / diłsoz/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* دلسۆژ: ١. خەمخۆر ‹یا خوا کەس دلسۆزی نەمرێ› ٢. سەپەرشتی باش ٣. خاوەن بەزەیی ١. دلسوز ٢. سرپرست خوب ٣. رحیم

**دڵسۆزی** / diłsozî/: ناو. *[کینایە]* دلسۆژی: ١. خەمخۆری ٢. بەزەوی؛ بەزەیی ١. دلسوزی ٢. رحم

**دڵسۆژی** / diłsojî/: ☜ **دڵسۆزی**

**دڵسوتاو** / diłsûtaw/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* دڵسوتی؛ زۆر بەتاسە بسیار آرزومند

**دڵسوتێن** / diłsûtên/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* جەرگبڕ جگرسوز

**دڵسەخت** / diłsext/: ☜ **دڵڕەق**

**دڵسەرد** / diłserd/: ☜ **دڵسارد**

**دڵشاد** / diłşad/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دلشا؛ دلشاد؛ دلخۆش؛ بەکەیف؛ دەماخچاخ ‹هەرکەس دلشاد بۆ بەی دنیای بێ پۆ/ ئاخر پەشیمان ڕەنجەڕۆ مەبۆ «خالۆی کۆماسی»›. هەروەها: **دڵشادی** دلشاد

**دڵشکاو** / diłş(i)kaw/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دڵشکست؛ دلشکستە؛ تووشیاری خەم و ناهومیدی بە هۆی نامرادی و ناکامییەوە ‹مەکەن مەنعم لە شیوەن ئەی ڕەفیقان/ کە مەحزوون و غەمین و دلشکاوم «نالی»› دلشکستە

**دڵشکاوی** / diłş(i)kawî/: ☜ **دڵشکستی**

**دڵشکست** / diłşikist/: ☜ **دڵشکاو**

**دڵشکسته** / dilşikiste/: ☜ **دڵشکاو**

**دڵشکستی** / dilşikistî/: ناو. دڵشکاوی؛ خەفەت و ناهومیدی زۆر بە هۆی نامرادی و ناکامییەوە ☰ دلشکستگی

**دڵشکێن** / dilş(i)kên/: ئاوەڵناو. [مەجاز] مایەی دڵشکان ☰ دل‌آزار

**دڵشێر** / dilşêr/: ئاوەڵناو. [مەجاز] ئازا؛ بوێر ☰ شیردل؛ شجاع

**دڵفراوان** / dilf(i)rawan/: ئاوەڵناو. [مەجاز] دڵفرەوان؛ دلفراوان: ١. دلاوا؛ سەخی ٢. لەسەرخۆ ☰ ١. بخشنده ٢. شکیبا

**دڵفرەوان** / dilf(i)rewan/: ☜ **دڵفراوان**

**دڵفڕێن** / dilf(i)řen/: ☜ **دڵڕفێن**

**دڵفەرێح** / dilferêĥ/: ئاوەڵناو. [کینایە] جێگای خۆش و دڵباز ‹دەشتێکی خۆش و دڵفەرێحە› ☰ دلگشا

**دڵق** / dilq/: ناو. دەڵق؛ مشەما؛ پلاستیکی ناسک بە ڕەنگی جۆراوجۆرەوە ☰ پلاستیک

**دڵقایم** / dilqayim/: ئاوەڵناو. بەورە؛ خۆڕاگر ☰ پُردل

**دڵقاییم** / dilqayîm/: ئاوەڵناو. ١. دڵنیا؛ ئارخەیان ٢. دلازا؛ ئازا؛ بەجەرگ ☰ ١. مطمئن ٢. دلیر

**دڵقی** / dilqî/: ئاوەڵناو. دلقین؛ دەڵقی؛ پلاستیکی ☰ پلاستیکی

**دڵقین** / dilqîn/: ☜ **دڵقی**

**دڵکرمن** / dilkirmin/: ☜ **دڵ‌کرمۆڵ**

**دڵکرمۆڵ** / dilkirmol/: ئاوەڵناو. [مەجاز] دڵ‌کرمن؛ دڵ‌کرمێ؛ دڵ‌پیس ☰ بدگمان

**دڵکرمێ** / dilkirmê/: ☜ **دڵ‌کرمۆڵ**

**دڵکڕ** / dilkiř/: ئاوەڵناو. [مەجاز] دڵبەر؛ دڵڕفێن ☰ دلکش

**دڵکوێر** / dilk(i)wêr/: ☜ **دڵ‌کۆر**

**دڵکۆ** / dilko/: ناو. ئامێری دابەشینی کارەبا بۆ تەقاندنەوەی سووتەمەنی لە موتوردا ☰ دلکو

**دڵکۆچەر** / dilkoçer/: ئاوەڵناو. [مەجاز] بێ‌دین ☰ بی‌دین

**دڵکۆر** / dilkor/: ئاوەڵناو. [مەجاز] دڵ‌کوێر؛ دەبەنگ؛ کەم‌فام؛ هیچنەزان ☰ کوردل

**دڵکەر** / dilker/: ئاوەڵناو. [پلار] کەردڵ؛ یەکجار کەمتەرخەم ☰ بیخیال

**دڵکێش** / dilkêş/: ئاوەڵناو. فوودڵ؛ جوانکیلەی خونچیلانە ☰ کوچولوی زیبا

**دڵکێشی** / dilkêşî/: ناو. سوڕ؛ ئاکاری دڵبەری ☰ دلربایی

**دڵگر** / dilgir/: ☜ **دڵگیر**

**دڵگران** / dilg(i)ran/: ئاوەڵناو. [مەجاز] ڕەنجاو؛ عاجز ☰ رنجیده‌خاطر

**دڵگراوی** / dilg(i)rawî/: ناو. [مەجاز] گیرۆدەیی؛ دڵبەستەیی؛ هەبوونی پێوەند و هۆگرەتی لە ناخی دڵەوە ☰ دلبستگی

**دڵگوشا** / dilguşa/: ئاوەڵناو. [مەجاز] دڵواز؛ هۆی دڵخۆشی ☰ دلگشا

**دڵگوشاد** / dilguşad/: ئاوەڵناو. [مەجاز] دلاوا؛ بەخشندە ☰ سخی طبع

**دڵگەرم** / dilgerm/: ئاوەڵناو. [کینایە] ١. چێ؛ بە دڵ کارکەر ٢. هیوادار؛ بەهومێد. هەروەها: **دڵگەرمی** ☰ ١. دلگرم ٢. امیدوار

**دڵگەش** / dilgeş/: ☜ **دڵزیندوو**

**دڵگەشێن** / dilgeşên/: ئاوەڵناو. [مەجاز] هۆی دڵخۆشی ☰ دل‌افروز

**دڵگەمار** / dilgemar/: ئاوەڵناو. [مەجاز] دڵ‌چەپەڵ؛ بیر و هزر خراپ؛ دڵ‌پیس ☰ بدنهاد

**دڵگەن** / dilgen/: ☜ **دڵپیس**

**دڵگەورە** / dilgewre/: ☜ **دڵزەخم**

**دڵگیر** / dilgîr/: ئاوەڵناو. [مەجاز] دڵگر: ١. خۆش؛ دڵ‌پەسند؛ تایبەتمەندی شوێنی خۆش ‹چوون

کۆی عەودالان، چوون کۆی عەودالان/ کـۆن؟ کۆیـێ دلـگیر، چـوون کـۆی عـەودالان؟! «سـەیدی»› ٢. ناخۆش؛ دڵنەگر ≚ ١. دلنشین ٢. ناخوشایند

**دلگیری** / dilgîrî/: ناو. *[مەجاز]* دڵتەنگی ≚ دلتنگی

**دڵلاوێن** / diłławên/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دڵنەوا؛ هۆی دڵ دامەزران و خۆشی ≚ دلنواز

**دڵلەخۆچوو** / diłlexoçû/: ئاوەڵناو. ١. گوهشـی؛ بێهۆش‌کەوتوو ٢. خودشـەیدا؛ حـەزوەخۆ ≚ ١. غش‌کرده ٢. خودشیفته

**دڵلەدوا** / diłled(i)wa/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* چاولـەدوا؛ نیگەران ≚ دلواپس

**دڵمردگ** / diłmirdig/: ☜ **دڵمردوو**

**دڵمردوو** / diłmirdû/: ئاوەڵـناو. *[کینایـە]* دڵمـری؛ دڵمردگ؛ دڵمردە؛ دڵمردی؛ بـەبێ دڵخۆشـی، گەشـە و نەشـە و هیـوا بـە ژیـان. هـەروەها: **دڵمردوویی** ≚ دل‌مُرده

**دڵمردە** / diłmirde/: ☜ **دڵمردوو**

**دڵمەن** / diłmen/: ☜ **دڵمەند**

**دڵمەنـد** / diłmend/: ئاوەڵـناو. *[مـەجاز]* دڵــــمەن؛ دڵئێشاو ≚ دلخور

**دڵمەنـدی** / diłmendî/: نـــاو. ١. دڵـــــمەنی؛ دڵئێشاوی ٢. *[مەجاز]* بوونی هـۆگرەتی و دڵ لـە لای شتێکدا بوون ‹بە ئارامی کە شێوەی دلمەندیی تۆیە/ مەڵێ بەس ئەم گوفت‌وگۆیـە «سـوارە»› ≚ ١. دلخوری ٢. دلبستگی

**دڵناسک** / diłnasik/: ئاوەڵـناو. *[مـەجاز]* ١. دڵـنەرم؛ دڵۆڤان ٢. کەم‌دڵ؛ خۆ ڕانەگر لە هەمبەر کـوڵ و کەسـەر و ئـازارەوە ✻ هـەروەها: **دڵناسکی** ≚ ١. مهربان ٢. دلنازک

**دڵنشـین** / diłn(i)şîn/: ئاوەڵـناو. *[مـەجاز]* خـۆش؛ دڵگیر ‹دەنگی دڵنشین› ≚ دلنشین

**دڵنـەخواز** / diłnex(i)waz/: ئاوەڵـناو. نابـــەدڵ؛ نەوەدڵ ≚ برخلاف میل

**دڵنـەرم** / diłnerm/: ئاوەڵناو. *[مـەجاز]* دڵڕەحمـین؛ بە بەزەیی ≚ دل‌رحم

**دڵنەرمی** / diłnermî/: نـاو. بەزەیی؛ بەزە؛ دلۆڤـانی ≚ دل‌نرمی

**دڵنـەگر** / diłnegir/: ئاوەڵـناو. دڵـگیر؛ نـاخۆش ≚ ناخوشایند

**دڵنـەماو** / diłnemaw/: ئاوەڵـناو. *[مـەجاز]* مـردوو؛ هیلاک ≚ شیفته

**دڵنـەوایی** / diłnewayî/: نـاو. *[مـەجاز]* دڵـجۆیی ≚ دلنوازی

**دڵنیـا** / diłn(i)ya/: ئاوەڵـناو. *[مـەجاز]* خاترجـــەم؛ ئارخەیان ‹من لەم وەستایە دڵنیام› ≚ آسوده‌خاطر؛ مطمئن

⊡ **دڵنیا بـوون**: *[مـەجاز]* خاترجـــەم بـــوون؛ شــک نەکردن ≚ مطمئن بودن

**دڵنیـایی** / diłn(i)yayî/: نـاو. *[مـەجاز]* ئارخـــەیانی؛ خاترجەمی؛ دۆخ یا حاڵەتی زەیـنی لـە نـەبوونی شک و گومان ‹شەرتی ژیان، دڵنیایی لە خێزان› ≚ دل‌قُرصی؛ اطمینان

**دڵنیشـان** / diłnîşan/: ئاوەڵـناو. *[مـەجاز]* دڵـــپێک؛ دڵبەر؛ دڵڕفێن ≚ دلبر

**دڵواز** / diłwaz/: ☜ **دڵگوشا**

**دڵ و دەروون** / dił û derûn/: نـاو. ١. بـیر و سـۆز ‹دڵ و دەروونت لـە ڕق بسـڕەوە!› ٢. ورە؛ جـەرگ ‹مرۆ دەبێ دڵ و دەروونـی بـێ و بـە تکـەیێ خـوێن نەبووریتەوە› ≚ ١. فکر و اندیشه ٢. دل و جرأت

**دڵوشک** / diłwişk/: ئاوەڵـناو. *[مـەجاز]* دڵـتەمری ≚ دل‌مُرده

**دڵوگیان** / dił û g(i)yan/: ناو. گیـان‌ودڵ؛ ژیـان و بەندی دڵ ≚ جان‌ودل

**دڵوەر** / diłwer/: ☜ **دڵبەر**

**دڵۆپ** / diłop/: نـاو. دڕۆپ؛ دڕۆپە؛ دڵـۆپ؛ دڵـوپ؛ دڕۆپ؛ دڵۆپە؛ تنۆک؛ تنۆکە؛ تکە؛ تک؛ دکە؛ چۆڕ؛

ئەوندە لە تراوێ کە بە شێوەی خڕ و گرۆڤەر دادەکەوێ 🇮🇷 قطره

**دڵۆپانـدن** / d(i)łopandin/: چـاوگ. سـافاندن؛ تکاندن؛ دڵۆپە پێ‌کردن 🇮🇷 چکاندن

**دڵۆپ. دڵۆپ** / diłop diłop/: ئاوەڵکار. نمە ـ نمە؛ تک ـ تک 🇮🇷 قطره ـ قطره

**دڵۆپە** / diłope/: ناو. ١. تکە؛ تنۆکە تراوێ کە لە بانەوە دەتکێ ٢. *[کینایە]* قسە لە ناو قسەدا 🇮🇷 ١. چکه ٢. حرف میان حرف

▣ **دڵۆپە کردن:** تکە کردن؛ لە بانەوە داکەوتنی تکەی ئاو ‹بانەکەمان دڵۆپە دەکا› 🇮🇷 چکه کردن

**دڵۆپە کردنە ناو قسەی کەسێک:** *[کینایە]* قسە بە کەسێ برین ‹تکایە کاتێ قسە دەکەم کەس دڵۆپەی تێدا نەکا› 🇮🇷 تو حرف کسی دویدن

**دڵەتەپە** / d(i)łetepe/: ☜ **دڵەتەپێ**

**دڵەتەپێ** / d(i)łetepê/: ناو. دڵەتەپە؛ دڵەڕەپێ؛ دڵەکوتە؛ دڵەکوتێ؛ دڵەگوڕپێ؛ چۆنیەتی توند لێدانی دڵ بە شێوەیێ کە هەستی پێ‌بکرێ 🇮🇷 تپش قلب

**دڵەخورپە** / d(i)łexurpe/: ☜ **دڵەخورپێ**

**دڵەخورپێ** / d(i)łexurpê/: ناو. دڵەخورپە؛ دڵەوڕێزە؛ نیگەرانی؛ دڵخورتی 🇮🇷 اضطراب

**دڵەدوا** / d(i)łed(i)wa/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دڵ‌سوار؛ دڵەودوا؛ چاوەدوا؛ چاولەدوو؛ نیگەران. هەروەها: **دڵەدوایی** 🇮🇷 دلواپس

**دڵەدەرد** / d(i)łederd/: ناو. ئێشی دڵ؛ ئانژینی دڵ 🇮🇷 آنژین قلبی

**دڵەڕاوکێ** / d(i)łeřawkê/: ناو. *[مەجاز]* دڵخورتی؛ نیگەرانی 🇮🇷 اضطراب

**دڵەڕبا** / d(i)łeř(i)ba/: ناو. چەشنێک عاقیقە بە هۆی دەنکە وردەی میکاوە بریکەی دێ و لە گەوهەرسازیدا بە کار دەچێ 🇮🇷 دلربا

**دڵەڕەپێ** / d(i)łeřepê/: ☜ **دڵەتەپێ**

**دڵەشێر** / d(i)łeşêr/: ناو. گیایەکە دوو گەڵای پان دەردەکا، لە بەینی گەڵاکانیدا دوو دەنک تـوو دروست دەبێ کە بە پێکەوە دەنووسن 🇮🇷 گیاهی است

**دڵەکپێ** / d(i)łek(i)pê/: ناو. قۆتک؛ مفاجات؛ موفاجات؛ جەڵتەی دڵ؛ سەکتەی دڵ؛ دۆخ یان چۆنیەتی وەستانی لەنکاوی دڵ 🇮🇷 سکتەی قلبی

**دڵەکزە** / d(i)łek(i)ze/: ☜ **دڵەکزێ**

**دڵەکزێ** / d(i)łek(i)zê/: ناو. دڵەکزە؛ چۆنیەتی کزانەوی سورێنچک و گەدە بە هۆی فرەترشی گەدە و هەڵگەڕانەوەی ترشاوی نێو گەدەوە 🇮🇷 سوزش مری و معده

**دڵەکوتە** / d(i)łekute/: ☜ **دڵەتەپێ**

**دڵەکوتێ** / d(i)łekutê/: ☜ **دڵەتەپێ**

**دڵەکەڵەشێر** / d(i)łekełeşêr/: ناو. جۆرێ ترێ 🇮🇷 نوعی انگور

**دڵەگوڕپێ** / d(i)łeguřpê/: ☜ **دڵەتەپێ**

**دڵەلەرزە** / d(i)łelerze/: ☜ **دڵەلەرزێ**

**دڵەلەرزێ** / d(i)łelerzê/: ناو. دڵەلەرزە؛ ترسی زۆر 🇮🇷 وحشت

**دڵەودوا** / d(i)łewd(i)wa/: ☜ **دڵەدوا**

**دڵەوڕێزە** / d(i)łew(i)rêze/: ☜ **دڵەخورپێ**

**دڵەیسۆ** / d(i)łeyso/: ناو. کاری پێکەوە نووسانی سەگ و تانجی کاتی جووت بوون 🇮🇷 عمل به هم چسبیدن سگ و تازی هنگام جفتگیری

**دڵیمە** / d(i)łîme/: ناو. ١. کەڵە؛ گیایەکی بێ‌گەڵای گوڵشینە لە نێو بێستاندا دەڕوێ و بێستانەکە وشک دەکا ٢. داوەڵی ناو بێستان 🇮🇷 ١. نوعی انگل جالیزی ٢. مترسک

**دڵێشە** / d(i)łêşe/: ☜ **دڵئێشە**

**دڵێنی** / d(i)łênî/: ☜ **دڵداری**

**دم** / dim/: ناو. ١. زار؛ دەم؛ دەڤ؛ زەهر ٢. کلک؛ دوم؛ دووڤ؛ جووچکە؛ دوم ٣. لووت؛ کەپۆ؛ بێڤل

٤. کێر؛ چووک؛ سیرەت ٥. دەم؛ کات ٦. کەنار؛ ڕەخ؛ قەراخ ☰ ١. دهان ٢. دُم ٣. بینی ۴. آلت مرد ۵. وقت ۶. کنار

◻ **دم شکاندن:** *[کینایە]* لووت شکاندن؛ تەمێ کردن ☰ توی دهن زدن

**دما** / d(i)ma/: ☜ **دوا**

**دمارەکوڵ** / d(i)marekuł/: ☜ **دمارەکۆڵ**

**دمارەکۆڵ** / d(i)marekoł/: ناو. دمارەکۆڵە؛ دومەرکۆڵ؛ دومارەکۆڵ؛ دەمارەکوڵ؛ دمارەکوڵ؛ دووپشک ☰ عقرب

**دمارەکۆڵە** / d(i)marekołe/: ☜ **دمارەکۆڵ**

**دماڕۆ** / d(i)mařo/: ناو. دواڕۆژ؛ داهاتوو ☰ آینده

**دمازا** / d(i)maza/: ناو. دوایین منداڵ ☰ آخرین فرزند

**دمان** / d(i)man/: ناو. ئیجارەی باغ یان مەزرا ☰ اجارەی باغ یا کشتزار

◻ **دمان کرن:** بە ئیجارە گرتنی باخ یان مەزرا ☰ اجاره کردن باغ یا کشتزار

**دماوە** / d(i)mawe/: ئاوەڵکار. ١. دوای ئەمە؛ دوای ئەوە؛ پاشی ٢. لە دواوە؛ لە پاشەوە ☰ ١. سپس؛ بعداً ٢. از عقب

**دماوەر** / d(i)mawer/: ☜ **دەماوەر**

**دمایی** / d(i)mayî/: ئاوەڵناو. ئاخری؛ لە ئاکامدا ☰ سرانجام

**دمایین** / d(i)mayîn/: ئاوەڵناو. دوایین؛ هەرە پاشین؛ ئاخری هەموو ☰ آخرین

**دمبلیدمباو**/ dimb(i)lîdimbaw/: ☜ **دیمبڵیدیمباو**

**دمبڵیدمباو**/ dimb(i)łîdimbaw/: ☜ **دیمبڵیدیمباو**

**دمبەدمە** / dimbed(i)me/: ☜ **دەمەقرە**

**دمبەست** / dimbest/: ناو. *[باوەڕی کۆن]* دۆعای مەلا بۆ بەستنی دەمی گورگ لە ئاژەڵ خواردن ☰ دعای دهان‌بند گرگ

**دمبەک** / dimbek/: ☜ **دمەك**

**دمبەگ** / dimbeg/: ☜ **دمەك**

**دمبەڵ** / dimbeł/: ☜ **دمەڵ**

**دمبەڵان** / dimbełan/: ناو. ١. چمە؛ چەشنێک کارگی خۆراکی کە لە ژێر خاکدایە و ڕووەکەی خڕە و بە ڕەنگی ڕەش، خۆڵەمێشی و سپی لە سروشتدا دەردەکەوێ ٢. دومبەلان؛ دۆبەلان؛ دونبەلان؛ دمەلان؛ دومەلان؛ دونبەڵمان؛ دنبەلان؛ دۆمبەران؛ کمێ؛ گونەلان؛ هێلکەگونی ئاژەڵ ٣. کەبابی دومبەلان ☰ ١. نوعی قارچ زیرِ خاک ٢. دُنبلان ٣. کباب دُنبلان

**دمبێن** / dimbên/: ☜ **دەمبێن**

**دمپاراو** / dimparaw/: ☜ **دەماوەر**

**دمپەڵو** / dimpełû/: ئاوەڵناو. *[پەلار]* قسەنەزانی شەرمێون ☰ نافصیحِ خجالتی

**دمجو** / dimcû/: ناو. دمەجاو؛ دەمەجاو؛ خۆراکی جاویاگ ☰ خوراک جویده‌شده

**دمخوار** / dimx(i)war/: ئاوەڵناو. کەوچولەوچ؛ کەوچە ☰ کج‌دهن

**دمڕاست** / dimřast/: ☜ **دەمڕاست**

**دمژین** / dimjîn/: ☜ **دژمان**

**دمس** / dims/: ناو. دۆشاو؛ شۆک ☰ شیره

**دمک** / dimik/: ☜ **دندوك**

**دمکانە** / dimkane/: ☜ **دەموکانە**

**دمگەرم** / dimgerm/: ☜ **دەمگەرم**

**دمل** / diml/: ئاوەڵناو. ناوشان پان ☰ چارشانه

**دملەقوت** / dimleqût/: ناو. چۆنیەتی لە خواردن دابڕان ☰ چگونگی از خوردن افتادن

**دملی** / dimlî/: ناو. زمانی زازایی؛ لە زاراوە باکوورییەکانی کوردستان ☰ زازایی؛ از گویش‌های زبان کردی

**دموچاو** / dim û çaw/: ناو. دەفک؛ ڕوخسار؛ سەروسیما ☰ چهره

**دمودو** / dim û dû/: ناو. وتە؛ گوتە؛ واتە ☰ بیان

▣ **بەدمەودو:** دەموراوێژخۆش ☰ شیرین‌سُخن

**دمه** / d(i)me/: ناو. دووگ؛ دووگـه؛ دووی پـەز ☰ دُنبه

**دمەتەقە** / d(i)meteqe/: ☜ **دەمەتەقێ**

**دمەجاو** / d(i)mecaw/: ناو. دەمەجاو: ۱. دەمجاو؛ یەکەیەک بـۆ جارێـک بنێشـت خسـتنە دەم ۲. ☜ **دمجو** ☰ ۱. سقز به اندازه‌ی یک نوبت جویدن ۲. ☜ **دمجو**

**دمەچێشتە** / d(i)meçêşte/: ☜ **دەمەچێشتە**

**دمەد** / d(i)med/: ناو. شیشی دارین ☰ سیخ چوبی

**دمەداچەقە** / d(i)medaçeqe/: ☜ **دەمەداچەقێ**

**دمەدم** / d(i)medim/: ناو. دەنگـی دەهـۆڵ ☰ آوازِ دُهُل

**دمەرواسـلە** / d(i)merwasle/: نـاو. گیایـەکی خۆڕسکی بڵندە، گوڵی چەتری سپی دەر دەکا ☰ شوید کوهی

**دمەزەرد** / d(i)mezerd/: ناو. دەمەزەرد؛ سەرنیای گاسن؛ کاری بە سەرکردنەوەی ئامرازی ئاسن ☰ مرمت ابزار آهنی

**دمەقاڵە** / d(i)meqałe/: ☜ **دەمەقڕە**

**دمـەک** / d(i)mek/: نـاو. دمبـەک؛ دمبـەگ؛ دمەلەک؛ دنبەگ؛ دومەمە؛ دومـەک؛ دومەلـەک؛ تومەلەک؛ سازێکی ئێرانی بـە بیچمـی تـۆنگی داریـن (سوالـەتی یـان کـانزایی) کـە بنەکـەی پەڕەپێستێکی ناسکی بـە سـەردا کێشـراوە و لـە کاتی لێداندا ملەکەی لە بن هەنگڵ دەنـێن و بـە سەرپەنجە لەو پەڕە دەدەن ☰ تُنبک

**دمـەکدڕاو** / d(i)mekd(i)řaw/: ناوەڵـناو. [کینایـە] دمەکدڕیاگ؛ تەپڵدڕاو؛ ناوزڕاو ☰ بدنام

**دمەکدڕیاگ** / d(i)mekdiřyag/: ☜ **دمەکدڕاو**

**دمـەکژەن** / d(i)mekjen/: نـاو. دومـەکژەن؛ دومەلەکژەن؛ دنبەگلێدەر ☰ تُنبک‌نواز

**دمەلاسکە** / d(i)melaske/: ☜ **دەمەلاسکە**

**دمەلاسکێ** / d(i)melaskê/: ☜ **دەمەلاسکە**

**دمەڵ** / d(i)meł/: نـاو. دمبـەڵ؛ دومـەل؛ دومـڵ؛ دومەڵ؛ دەمبەڵ؛ کـوان؛ کـۆن؛ کوڤـان؛ کۆڤـان؛ کەوەن؛ کونک؛ کولک؛ کوێرەک؛ ئارێنج؛ پـرزک؛ ئاشـین؛ ئاماسـە؛ کـونێر؛ قـونێر؛ گـۆنر؛ چافـک؛ پەڤێژۆک؛ مـادە؛ لـۆک؛ هالـی؛ بلـۆقی چڵـکینی بەژان کە لە ژێر پێستەوە دەردێ ☰ دُمل

**دمەڵان** / d(i)mełan/: ☜ **دمبەڵان ـ۲**

**دمەڵەک** / d(i)mełek/: ☜ **دمەك**

**دمەوڕو** / d(i)mewřû/: ☜ **دەمەوڕوو**

**دمەهۆسنگنێ** / dimehosing(i)nê/: ☜ **دوهەژینك**

**دمهار** / dimhar/: ناوەڵناو. زۆر بە قسە ☰ پُرحرف

**دمهەراش** / dimheraş/: ☜ **دەمەوەر**

**دمهەڵپێچ** / dimhełpêç/: ☜ **دەمهەڵپێچ**

**دمهەڵە** / dimhełe/: ☜ **دەمەوەر**

**دن**[1] / din/: ناو. ددانە ☰ دندانه

**دن**[2]: ناوەڵناو. دی؛ دیکە؛ ئیتر ☰ دیگر

**دنا** / d(i)na/: ☜ **دنیا**

**دنان** / d(i)nan/: ☜ **ددان**

**دنانە** / d(i)nane/: ☜ **ددانە**

**دنبەگ** / dinbeg/: ☜ **دمەك**

**دنبەگلێدەر** / dinbeglêder/: ☜ **دمەكژەن**

**دنبەڵان** / dinbełan/: ☜ **دمبەڵان ـ۲**

**دنج** / dinc/: ناوەڵناو. ئارام؛ بێ دەنگ و قاڵ ☰ دنج

**دند** / dind/: ناو. دەندە ☰ وسیله‌ای در خیش

**دندان** / dindan/: ☜ **ددان**

**دندک** / dindik/: ناو. دەنک؛ ناوکی میوە ☰ هسته

**دنـدوک** / dindûk/: نـاو. دانـدووک؛ دەنـدووک؛ دەنووک؛ دومـدووک؛ دونـدووک؛ دمـک؛ نیکـل؛ نکل؛ نوکل؛ شەند؛ نـەقور؛ لێـوی ڕەقهـەڵاتووی پەلەوەر ☰ منقار

**دندوکبێڵـە** / dindûkbêłe/: نـاو. باڵـندەیەکی کۆچەرە لە تۆرەمەی قەرەناز، لە شاوە و لەگلەگ

دەچێ. جەستەی ٥٨ سانتیمیتر دەبێ، پەڕ و باڵی سپی، دندووکی درێژ و ڕەش، سەری دندووکی پان و زەردە، بە گەل دەژی، نێرەکەی سەربەکلاوەیە، لە تەنکاوان ماسی، بۆق و شینکە دەخوا ■ کفچەنُک

**دندووکدار / dindûkdar/**: ئاوەڵناو. شەندەڵی؛ دەنووکدار ■ دارای منقار

**دندووکسور / dindûksûr/**: ناو. باڵندەیەکی لاق و دەندووک سوور و درێژە لە گوێ چۆمان دەژی و ماسی دەگرێت ■ صدف‌خوار

**دندووکقاژویی / dindûkqajûyî/**: ناو. جۆرێ گوێزی درێژۆکەیە، کاکڵەی باش دەرنایە ■ نوعی گردو

**دندووکە / dindûke/**: ناو. ١. زۆپی؛ قیتی؛ گتایی ٢. ☜ **دەمەقڕە** ■ ١. برجستگی ٢. ☜ **دەمەقڕە**

⊡ **دندووکە دان**: ١. چەکەرە دان ٢. شکۆفە و چڵوو دەرکردن ■ ١. جوانە زدن دانە ٢. جوانە زدن درخت

**دنک / dinik/**: ناو. ١. دەسکاونگ؛ ئاونگی دەسک ٢. دانە؛ دەنک ■ ١. دستەی هاون ٢. دانە

**دنکێ / dinkê/**: ئاوەڵکار. گلێ؛ یەک دەنک ■ دانەای

**دنکێک / dinkêk/**: ☜ **دانەیەك**

**دنگ[1] / ding/**: ناو. ١. دینگ؛ ئامرازی چەڵتووک کوتان ٢. هاوەن؛ ئاوان ٣. دەنگ ٤. مشت؛ مستەکۆڵە ٥. شەونم ■ ١. دنگ شالیکوبی ٢. هاون ٣. صدا ۴. مُشت ۵. شبنم

**دنگ[2]**: ئاوەڵناو. هەڵمساو؛ باکردوو ■ آماسیده

⊡ **دنگ بوون**: زگ هەڵمسان لە بەر زۆر خواردن ■ آماسیدن شکم بر اثر پُرخوری

**دنگ لێدان**: مشت لێدان ■ با مشت کوبیدن

**دنگبێژ / dingbêj/**: ☜ **دەنگبێژ**

**دنگچی / dingçî/**: ☜ **دنگ‌کوت**

**دنگز / dingiz/**: ئاوەڵناو. فیتنە؛ ئاژاوەچی ■ دوبەهم‌زن

**دنگکوت / dingkut/**: ناو. دنگچی؛ وەستای دنگی چەڵتووک کوتان ■ دنگ‌کوب

**دنگلاڤ / dinglav/**: ☜ **دنگهلەڤ**

**دنگە / dinge/**: ناو. ١. دینگە؛ کۆڵەکەی لە قوڕ و بەرد ٢. دنگ؛ ئاوان ■ ١. ستون از سنگ و گل ٢. هاون

**دنگەدنگ / dingeding/**: دەنگەناو. گرمەگرمی دەهۆڵ ■ صدای پیاپی دُهُل

**دنگهلەڤ / dingh(i)lev/**: ناو. دنگلاڤ؛ هەلۆرک؛ لەلوو ■ نَنو

**دننە / dinne/**: ناو. پەراسوو ■ دندە

**دنودەرکی / d(i)nuderkî/**: ددانی دەسکرد ■ دندان مصنوعی

**دنو / d(i)nû/**: ☜ **ددان**

**دنوریچە / d(i)nûřîçe/**: ناو. دیانەکیرە؛ ددانەکرۆژە؛ دانەجیرێ؛ دانەچیڕ؛ ددانەچیڕە؛ ددانەچیڕێ؛ دیانڕیچەکی ■ دندان‌قروچە

**دنە / d(i)ne/**: ناو. هانە؛ کار و ڕەوتی هەڵخڕاندن ■ تحریک

⊡ **دنە دان**: هانە دان ‹دنەی خەڵکیان ئەدا، بێنە سەر شەقام› ■ تحریک کردن

**دنەدراو / d(i)ned(i)raw/**: ئاوەڵناو. هەڵخڕاو؛ هەلکری ■ تحریک‌شده

**دنەدەر / d(i)neder/**: ئاوەڵناو. هانەدەر ■ مُحرک

**دنیا / dinya/**: ناو. دنا؛ دنێ؛ دونیا: ١. جیهان؛ جەهان؛ عالەم؛ گەردوون ‹دنیا سەری بە پووش نەگیراوە «مەسەل»› ٢. دانیشتوانی زەوی ‹دنیا دەزانێ› ٣. تاقمێکی دیاریکراو لە خەڵک و حەز و خوازی تایبەت ‹دنیا بێژێ گاڵ، تۆ بتەپە ماڵ! «مەسەل»› ٤. عالەم؛ کار و بار و حەز و بەزی ژیان ‹لە دنیا بڕان› ٥. ژینگە و دەور و بەری هەر

کەسێک ‹دنیایەکی بچووکی هەیە› ☰ ١. جهان ٢. همەی مردم ٣ تا ٥. دنیا

▣ **ئەم دنیا:** ژیانی دنیایی ‹هیوادارم لە ئەم دنیا بەختەوەر بی› ☰ این دنیا

**ئەو دنیا:** دنیای پاش مەرگ ‹لە ئەو دنیا دەبێ وەڵام بدەیتەوە› ☰ آخرت

▣ **دنیا بە قونە کەو کردن:** *[مەجاز]* خاوەنی تاقیکاری و ئەزموونی زۆر بوون ☰ تجربەی فراوان داشتن

**دنیا بە کۆڵەوە گرتن:** *[مەجاز]* دڵ بە دنیا خۆش کردن و زۆر بەتەماح بوون ☰ چنگ بە دنیا زدن؛ حریص بودن

**دنیا دانە پاوە:** *[کینایە]* زۆر گەڕان ‹دنیام دا پاوە، نەمدۆزییەوە› ☰ بسیار گشتن

**لە دنیا دەرچوون:** کۆچی دوایی کردن ☰ مُردن

**هاتنە دنیا:** لە دایک بوون ☰ متولد شدن

**دنیائاخری** / dinya'ax(i)rî/: ناو. ئاخرزەمان ☰ آخرزمان

**دنیابوو** / dinyabû/: ئاوەڵکار. بەشکایەک؛ بەشکایەکوو؛ ئەگەرکوو ☰ احیاناً

**دنیاپەرست** / dinyaperist/: ئاوەڵناو. خوازەڵۆکی ماڵ و دارایی دنیا ☰ دنیاپرست

**دنیاداری** / dinyadarî/: ناو. کار و ڕەوتی سامان پێکەوە نان ☰ دنیاداری

**دنیادۆس** / dinyados/: ئاوەڵناو. *[پلار]* ماڵپەرست؛ ماڵخۆشەویست ☰ دنیادوست

**دنیادیدە** / dinyadîde/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* دنیادییە؛ ئاگا لە کاری دنیا، بە هۆی زۆر گەڕان و تێپەڕانی تەمەن ☰ جهاندیدە

**دنیادیە** / dinyad(i)ye/: ئاوەڵناو. *[پلار]* دیتی؛ گەڕیدە؛ خاوەن ئەزموون و ئاگاداری بە هۆی سەفەر کردنی زۆر ☰ دنیادیدە

**دنیادییە** / dinyadîye/: ☜ **دنیادیدە**

**دنیار** / dinyar/: ئاوەڵناو. پێداگر و سوور لە سەر کۆ کردنەوەی ماڵ و دارایی. هەروەها: **دنیاری** ☰ دنیادار

**دنیاگەڕ** / dinyageř/: ناو. گەشتیار؛ گەشتۆک؛ ئەوەی بۆ گەشت و سەیران سەفەر دەکا ‹شوورەوی ویستوویە پاش وێران بوون ئاوایان کاتەوە تا دنیاگەڕان بەهرەی لێ ببینن «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ جهانگرد

**دنیانەخواردوو** / dinyanex(i)wardû/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ١. کاڵ؛ تازە پێگەیشتووی بێئەزموون ‹چون گەنجی تازەی دنیانەخواردوو/ چەن پیری پاکی تەمەن ڕابردوو «قانع»› ٢. بە ئاکام نەگەیشتوو ☰ ١. نورسیدە ٢. ناکام

**دنیایە** / dinyaye/: سارستە. ڕەنگە؛ وێدەچێ؛ گریمان ☰ شاید

**دنیایی** / dinyayî/: ئاوەڵناو. پێوەندیدار یان سەر بە دنیاوە ☰ دنیوی

**دنێ** / d(i)nê/: ☜ **دنیا**

**دنێب** / d(i)nêb/: ☜ **زیڤان**

**دوا**[1] / d(i)wa/: ناو. دما؛ دوما: ١. ئەو بەشەی لەش کە لای پێچەوانەی بەر (سینە و زگ و ...) هەڵکەوتووە ‹بە دوای مندا دەهات› ٢. ئەو بەشە لە هەر شتێ کە لە بەرامبەرەوە نابینەدرێ ‹چرایەکی دوای سووتاوە› ٣. دووچکە (لە مەل و باڵندەدا) ٤. کلک (لە گیانەوەراندا) ٥. بەشێ لە شتێ یان کۆمەڵەیەک کە بەستراوە بە پشتەوە ☰ ١. پُشت ٢. پس ٣و٤. دُم ٥. دُنباله

▣ **لە دوای:** بە شوێن ☰ بە دنبالِ

▣ **دوا بران:** لە بەین چوون؛ ئاسەوار بڕان؛ قڕ هاتن ☰ ریشەکن شدن

**دوا پێهێنان:** دوا هێنان؛ دوایی (پێ)هێنان؛ هیچ نەهێشتنەوە؛ خەلاس کردن ‹مەرگە دێ و دوا بە هەموو شت دێنێ/ هەموو ئاواتێ لە دڵ

دەستێنێ «سوارە»› 🇮🇷 تمام کردن

**دوا کەوتن:** ١. بەجێ مان؛ مانەوە ‹ساڵێک لە دەرسەکەی دوا کەوت› ٢. دانە پەی؛ شوێن کەوتن ‹ئێمە دوای ئەو کەوتین و سەگەکەش دوای ئێمە› ٣. شوێن کەوتن؛ ڕێ و ڕێبازی کەسێک گرتن ‹لاوێکی زۆر دوای کەوتن› ٤. کەوتنە دواوە؛ بۆ کاتێکی درەنگتر گۆزرانەوە ‹دانیشتنەکە دوا کەوت بۆ سێ سەعاتی تر› 🇮🇷 ١. جا ماندن ٢. تعقیب کردن ٣. پیروی کردن ۴. عقب افتادن

**دوا هێنان:** ☜ **دوا پێ‌هێنان**

**دواوە دان:** گەڕاندنەوە؛ وەگەڕاندن 🇮🇷 پس دادن؛ برگرداندن

**بردنە دواوە:** بەرەو پاش بردن 🇮🇷 عقب بردن

**چوونە دواوە:** بەرەو پاش ڕۆین 🇮🇷 عقب رفتن

**خستنە دواوە:** (وە)دوا خستن؛ وە پاش خستن 🇮🇷 عقب انداختن

**دانە دواوە:** ١. هێز تێدا نەمان ٢. *[مەجاز]* بەرەو پاش چوون ٣. *[کۆن]* دەست لە خوێندن هەڵگرتن 🇮🇷 ١. از نا افتادن ٢. اُفت کردن ٣. ترک تحصیل کردن

**کەوتنە دواوە:** جێ‌مان؛ بەجێ‌مان 🇮🇷 عقب ماندن

**(وە)دوا خستن:** ☜ **خستنە دواوە**

**هاتنە دواوە:** بەرەو دوا هاتن 🇮🇷 عقب آمدن

**دوا**[٢]: ئاوەڵناو. پاشین؛ دوایین؛ دما؛ دوما؛ دوایی؛ دومایی؛ دمایی؛ ئاخری ‹دەرکی دوا› 🇮🇷 پسین

**دوا**[٣]: ئاوەڵکار. پشت؛ دوما؛ دما ‹لە دوا دانیشتم› 🇮🇷 پس؛ عقب

**دوا ـ**[٤]: پێشوشە. ١. بەندیوار یا پێوەندیدار بە کاتی داهاتوو ‹دوارۆژ› ٢. بەندیوار یا پێوەندیدار بە پاش ڕووداو یان کارێک ‹دواچۆڕ؛ دواهەناسە› 🇮🇷 ١و٢. پس ـ؛ پسا ـ

**دوائاژۆ** / d(i)wa'ajo/: ☜ **دواشوان**

**دواباز** / d(i)wabaz/: ناو. جادووگەر؛ جادووباز 🇮🇷 جادوگر

**دواباش** / d(i)wabaş/: ناو. دووباش؛ پاش‌مەلا؛ دووهەمین کەس لە مێشێندا 🇮🇷 دوم بازیکن گردوبازی

**دوابڕاو** / d(i)wab(i)řaw/: ئاوەڵناو. ١. *[کینایە]* دوابڕیاگ؛ دوابڕیاو؛ قڕهاتوو ٢. *[پلار]* خەساو؛ خەسیاگ 🇮🇷 ١. ریشەکن‌شده ٢. مقطوع‌النسل

**دوابڕیاگ** / d(i)wabiřyag/: ☜ **دوابڕاو**

**دوابڕیاو** / d(i)wabiřyaw/: ☜ **دوابڕاو**

**دوابەدوا** / d(i)wabed(i)wa/: ئاوەڵکار. دواوەدوا: ١. لە دوای یەکتر ‹دوابەدوا دەهاتن و داوای ئاویان دەکرد› ٢. بە شوێندا ‹دوابەدوای تۆ دێم› ٣. پشتاوپشت؛ بە پێچەوانە و ڕوو لە دواوە ‹دوابەدوا ڕۆیشتن› 🇮🇷 ١. پشت سر هم ٢. عقب ٣. عقب ـ عقب

**دوابەگ** / d(i)wabeg/: ناو. جێگر؛ جێ‌نشین 🇮🇷 جانشین

**دوابەند** / d(i)wabend/: ناو. پاشبەند؛ کۆپلەی ئاخر 🇮🇷 آخرین بند

**دوابینی** / d(i)wabînî/: ناو. دووربینی؛ پێش‌بینی؛ کاڤشکی؛ بەربووری؛ کار و ڕەوتی هەڵسەنگاندنی ئاکام و کاردانەوەی کاروبار لە داهاتوودا. هەروەها: **دوابین** 🇮🇷 دوراندیشی

**دواپارێز** / d(i)waparêz/: ناو. پاشەنگ؛ پاشکۆی سپا 🇮🇷 مؤخرەی لشکر

**دواتر** / d(i)watir/: ئاوەڵکار. دوایی؛ ئەمجا؛ داهی 🇮🇷 سپس؛ آنگاه

**دواجەنگ** / d(i)waceng/: ناو. دوایی لەشکر؛ ئەو شەڕکەرانەی پاشی لەشکر دەپارێزن 🇮🇷 مؤخرەی لشکر

**دواچۆڕ** / d(i)waçoř/: ناو. ١. ئاخر دڵۆپ ٢. *[کینایە]* ئاخر منداڵ ٣. بەشی ئاخری هەر شتێ 🇮🇷 ١. آخرین قطره ٢. تەتغاری ٣. اواخر

**دواخ** / d(i)wax/: ناو. ڕووبەند؛ دەمامەک ☰ نقاب

**دواخر** / d(i)waxir/: ☜ **دواخری**

**دواخری** / d(i)wax(i)rî/: ئاوەڵکار. دواخر؛ ئاخری؛ سەرەنجام ‹بڕێک هەواڵپرسی کردین و دواخری ڕۆیشت› ☰ بالاخره؛ عاقبت

**دوادانە** / d(i)wadane/: جێناو. دوایین دانە؛ دوایین دەنک: ١. بە تێکڕایی؛ بە گشتی ‹دوادانەم بژارد› ٢. ئاخر دانە؛ دواگین؛ ئەوی لە دوای هەمووە ‹ئەمە دوادانە بوو› ☰ ١. همه ٢. آخری

**دوادوایی** / d(i)wad(i)wayî/: ئاوەڵکار. ئاخر و ئۆخر ☰ اواخر

**دوادە** / d(i)wade/: ناو. بژاری دووبارە ☰ وجین برای بار دوم

**دوار** / d(i)war/: ☜ **دەوار-٣**

**دوارد** / d(i)ward/: ☜ **دوێرد**

**دوارە** / d(i)ware/: ☜ **دوبارە**

**دواڕۆژ** / d(i)wařoj/: ناو. داهاتوو؛ ئایندە؛ ڕۆژانی پاش ‹لە پێشماندایە دواڕۆژێکی ڕووناک/ ئیتر ناخورێ هەقی ئێمە بە فیڕۆ «هێمن»› ☰ آینده

**دوازدە**[1] / d(i)wazde/: ناو. دوانزە؛ ژمارەی سەرەکی نێوان یازدە و سێزدە ☰ دوازده

**دوازدە**[2]: ئاوەڵناو. دوانزە: ١. یەکێ زۆرتر لە یازدە دانە ٢. دوازدەهەم؛ دوانزەهەم ☰ ١و٢. دوازده

**دوازدەگری** / d(i)wazdeg(i)rê/: ناو. دوانزەڵە؛ سەرەتای ڕیخۆڵەی بچووک لە گواندارندا ☰ اثناعشر

**دوازدەمین** / d(i)wazdemîn/: ئاوەڵناو. دوازدەهەم؛ دوازدەهەمین؛ دوانزەمین؛ دوانزەهەم؛ دوانزەهەمین؛ دوانزەیەمین؛ بە پلە و پایەی دوازدەهەمەوە ☰ دوازدهم

**دوازدەهەم** / d(i)wazdehem/: ☜ **دوازدەمین**

**دوازدەهەمین** / d(i)wazdehemîn/: ☜ **دوازدەمین**

**دواژە** / d(i)waje/: ☜ **دواشوان**

**دواسک** / d(i)wasik/: ناو. ١. قوولینچکی لای گۆشەی چاو ٢. دواهەمین زا و زێ ☰ ١. گوشەی بیرونی چشم ٢. آخرین زایمان

**دواشوان** / d(i)waş(i)wan/: ناو. دوائاژۆ؛ دواژە؛ دواوان؛ کۆمەکی شوان ☰ کمک چوپان

**دواکۆچ** / d(i)wakoç/: ناو. کۆچی دوایی؛ مەرگ ☰ وفات

**دواکەفتگ** / d(i)wakeftig/: ☜ **دواکەوتوو**

**دواکەوت** / d(i)wakewt/: ناو. دیرس؛ دیرهات؛ درەنگ ☰ درنگ؛ تأخیر

**دواکەوتوو** / d(i)wakewtû/: ئاوەڵناو. دواکەوتە؛ دواکەفتگ؛ بەجێماو؛ جێماو ☰ عقب‌افتاده

**دواکەوتە** / d(i)wakewte/: ☜ **دواکەوتوو**

**دواگیان** / d(i)wag(i)yan/: ناو. دوا هەناسەی ژیان ‹بەفر و باران و بلووکەت هەر وەکوو گریانمە/ تۆ خەریکی مردنی بۆیە منیش دواگیانمە «قانع»› ☰ آخرین دم

**دواگین** / d(i)wagîn/: ☜ **دوایین**

**دوامنداڵ** / d(i)wamindał/: ناو. پاشبەر ☰ آخرین فرزند

**دوامەتی** / d(i)wametî/: ناو. کۆتایی ☰ عاقبت

**دوامین** / d(i)wamîn/: ئاوەڵناو. ئاخری؛ ئاخرین ‹دوامین کاتەکانی ژیان؛ دوامین فیشەک› ☰ آخرین

**دوان** / diwan/: چاوگ. تێپەڕ. //دوای؛ دەدوێی؛ بدوێ// دوای: ١. قسە کردن؛ گفت‌وگۆ کردن ٢. وتار دان ٣. *[پلار]* وڕ لێدان ‹بەسە! کەم بدوێ!› ☰ ١. حرف زدن ٢. سخنرانی کردن ٣. یاوه گفتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: دواو/ چاوگی نەرێنی: نەدوان

**دوان**[1] / duwan/: ناو. ١. دوو دانە ‹دوان هەڵگرە!› ٢. دوو ‹ئەو دوانەت پێ چۆنن؟› ☰ ١. دو عدد؛ دو تا ٢. دو

**دوان**[2]: جێناو. دوو دانە ‹دوان لە هێلکەکان

داکەوتبوون؛ چەن کانیتان چاو پێ کەوت؟ دوان› ☗ دو عدد

**دواندن** / d(i)wandin/: چاوگ. تێپەڕ. //دواندت؛ دەدوێنی؛ بدوێنە// دۆنای: ١. قسە لەگەڵ کردن ‹بۆچ لێم زیزی؟ نامدوێنی› ٢. هێنانە قسە ☗ ١. همصحبت شدن ٢. به حرف آوردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەدواندن

**دوانزە** / d(i)wanze/: ☜ دوازدە

**دوانزەڵە** / d(i)wanzełe/: ☜ دوازدەگرێ

**دوانزەمین** / d(i)wanzemîn/: ☜ دوازدەمین

**دوانزەهەم** / d(i)wanzehem/: ☜ دوازدەمین

**دوانزەهەمین** / d(i)wanzehemîn/: ☜ دوازدەمین

**دوانزەیەمین** / d(i)wanzeyemîn/: ☜ دوازدەمین

**دوانگە** / d(i)wange/: ناو. مینبەر ☗ منبر

**دوانە**[١] / d(i)wane/: ☜ دۆدانە

**دوانە**[٢]: ئاوەڵناو. لفەدوانە؛ دوودانە؛ جمک؛ جفک ☗ دوقلو

**دوانهاوەر** / d(i)wanhawer/: ئاوەڵناو. دوانەزا ‹بزنە ڕەشەگەی دوانهاوەرم/ سەربەرزی هاومال پای سەماوەرم «فولکلۆر»› ☗ دوقلوزا

**دوانی** / d(i)wanî/: ئاوەڵکار. دووبەدوو؛ دوان پێکەوە ☗ دوتایی

**دواوان** / d(i)wawan/: ناو. ١. ڕێژاو؛ جێگەی پێک گەیشتنی دوو چەم ‹هەر لە بناوانی دەجلە و فوراتەوە تا لێکدانەوەی دواوانەکەی هاتم «هەژار، *شەرەفنامە*»› ٢. ☜ دواشوان ☗ ١. مَصب ٢. ☜ دواشوان

**دواوە**[١] / d(i)wawe/: ناو. پاشەوە؛ پشتەوە ‹دواوەی ماشینەکەم بەتالە!› ☗ عقب؛ پُشت

**دواوە**[٢]: ئاوەڵکار. دوایی؛ پاشان ‹دواوە دێم؛ دواوە چ دەکەی؟› ☗ بعداً

**دواوەدوا** / d(i)wawed(i)wa/: ئاوەڵکار. بەراوپشت؛ قنگاوقنگ ☗ عقب‌عقب

**دواهەناسە** / d(i)wahenase/: ناو. ئاوزینگ؛ ئاویلکە؛ گیانەلاو ☗ نفس‌های آخر

**دوای**[١] / d(i)way/: ☜ دوان

**دوای**[٢]: ناو. دەوا؛ دەرمان ☗ دارو

**دوای**[٣]: ئامراز. لە دوای؛ پاشی ‹دوای قسەکانی تێر و پڕ تۆپاندبوویان!› ☗ پس از

**دوای‌نیمەڕۆ** / d(i)way nîmeřo/: ناو. پاشنویژ؛ پاش‌نیوەڕۆ ☗ بعدازظهر

**دوایە** / d(i)waye/: ناو. دوابااز؛ جادووگەر؛ جادووباز؛ چاچۆلگەر ☗ جادوگر

**دوایەک**[١] / d(i)wayek/: ئاوەڵناو. دوایین؛ دواگین ☗ آخرین

**دوایەک**[٢]: ئاوەڵکار. بە شوێن یەکا ☗ به دنبال هم

**دوایی**[١] / d(i)wayî/: ناو. کۆتایی؛ دوماهی؛ دومایی ☗ پایان

⊡ **دوایی پێ‌هێنان**: ☜ **دوا پێ‌هێنان**

**دوایی هاتن**: قوتار بوون؛ تەواو بوون ☗ تمام شدن؛ به پایان رسیدن

**دوایی هێنان**: ☜ **دوا پێ‌هێنان**

**دوایی**[٢]: ئاوەڵناو. دومایی؛ دوماهی؛ پاشین؛ ئاخرین ☗ پسین

**دوایی**[٣]: ئاوەڵکار. دواتر؛ دوماهی؛ دومایی؛ پاشتر؛ ئەوجار ‹دوایی دێم بۆ مالتان› ☗ سپس؛ بعداً

**دوایی‌دار** / d(i)wayîdar/: ئاوەڵناو. کلکدار ☗ دُنبالەدار

**دوایین** / d(i)wayîn/: ئاوەڵناو. دواگین؛ پاشین؛ دوایی؛ ئاخرین ‹دوایین هەناسە› ☗ آخرین

**دوایین‌دانە** / d(i)wayîndane/: ☜ دوادانە

**دوایین‌دەنک** / d(i)wayîndenik/: ☜ دوادانە

**دوایی‌هاتو** / d(i)wayîhatû/: ئاوەڵناو. خەلاس؛ تەواوبوو ☗ تمام‌شده

**دوباد** / dubad/: ئاوەڵناو. دووتا: ١. دووباد؛ دوو جار بادراو ‹گورزەهۆنی سیرمەی دوبادی لە ملدا «هەژار،

*قورئان*» ٢. پتەوی بەهێز (بارەبەر) ☰ ١. دولا ٢. نیرومند (باربر)

**دوباره** / dubare/: ☜ **دووباره**

**دوبشی** / dubşî/: ناو. لوو؛ گرێ لە ناو گۆشتدا ☰ غُدّه

**دوبەختی** / dubextî/: ☜ **دووبەختەکی**

**دوپینگ** / dupîng/: ناو. کارەڕەهاتی کەلک وەرگرتنی وەرزشکار لە ماکی هێزدەر، پێش دەسپێکردنی یاری ☰ دوپینگ

**دوت** / dut/: ناو. دت؛ دوەت؛ دوێت؛ دوێتە؛ دۆت؛ دۆد؛ کەنیشک؛ کچ ☰ دُختر

**دوتار** / dutar/: ☜ **دوتار**

**دوچ** / duç/: سارستە. نەکەی؛ نەچی وا بکەی ☰ زنهار

**دوچار** / duçar/: ئاوەڵناو. تووش؛ تووشیار؛ گیرۆدە؛ ئاوقە ☰ دُچار

**دوچاری** / duçarî/: ناو. گیرۆدەیی؛ گرفتاری ☰ گرفتاری

**دوچکە** / duçke/: ناو. کلک؛ جووجکە؛ دووچکە ☰ دُم

**دوخان** / duxan/: ناو. کوڵ و زووخاو؛ دەرد و داخ ☰ داغ و حسرت

**دوخرمە** / duxreme/: ☜ **دۆغرمە**

**دوخشار** / duxşar/: ☜ **دژوار**

**دوخمان**[1] / duxman/: ناو. خائین؛ خایەن؛ کەسێ کە تووشی تاوان و خەیانەت بووە ☰ خائن

**دوخمان**[2]: ئاوەڵناو. ١. نەگەویس؛ بێفەڕ ٢. خائین؛ خایەن؛ خاوەنی خووخدە یان هۆگریی بە خەیانەت ☰ ١. بی‌نمود ٢. خائن

**دوخمانی** / duxmanî/: ناو. خەیانەت؛ ناپاکی ☰ خیانت

**دوخهەفسار** / duxhevsar/: ناو. دەسکەوسار ☰ افسار

**دوخیانەت** / duxyanet/: ☜ **دۆخیان**

**دوخین** / duxîn/: ☜ **دۆخین**

**دودرگ** / dudirg/: ناو. کەو؛ کاو؛ کۆوک ☰ کبک

**دودەنگە** / dudenge/: ناو. چریکە؛ دەنگی باڵندە ☰ آواز پرنده

**دوراج** / durac/: ناو. پۆڕ؛ ئاقدەل ☰ دُرّاج

**دوراخ** / durax/: ناو. شویت؛ شیوت ☰ شبت؛ شوید

**دوربە** / durbe/: ناو. پەسیو ☰ پستو

**دورج** / durc/: ناو. مجری؛ سندووقی چکۆلەی جێگای شتی گرانبایی ☰ ورج

**دورچ** / durç/: ناو. قەفەس؛ ڕکە ☰ قفس

**دورزو** / durzû/: ناو. کێشە و هەرا و قاڵمەقاڵم ☰ همهمه؛ جنجال

**دورزیلە** / durzîle/: ☜ **دەسخورین**

**دورس** / duris/: ☜ **دروست**

**دورست** / durist/: ☜ **دروست**

**دورشت** / durişt/: ☜ **درشت-٢**

**دورف** / durf/: ناو. درۆشم؛ نیشانە ☰ علامت

**دورڤەیی** / durveyî/: ناو. بێگانە؛ بیانی ☰ بیگانه

**دورک** / durk/: ناو. شەپۆڕنامە؛ شین‌نامە ☰ مرثیه

**دورگ** / durg/: ناو. کەو ☰ کبک

**دورمان** / durman/: ناو. کێڵ؛ کاری دروون ☰ دوخت

**دورملک** / durmilk/: ناو. جۆرێ کوولەکە ☰ نوعی کدو

**دورمە** / durme/: ناو. دورووم؛ بابۆڵە؛ تیکەی پێچراو ☰ ساندویچ

**دورمەح** / durmeĥ/: ئاوەڵناو. جووتەوەشێن؛ لەقەهاوێژ؛ لووشکاوێژ ☰ لگدپران

**دورۆک** / durok/: ناو. دیرک؛ دیرۆک ☰ تاریخ

**دوروم** / durûm/: ☜ **دورمە**

**دوریش** / durîş/: ☜ **دەرویش**

**دوڕ**[1] / duř/: ناو. ١. نێوان؛ ناوەڕاست ٢. مرواری

درشت 🇮🇷 ١. وسط ٢. مروارید درشت

◘ **دوڕی تاقانە**: ١. مرواری تەنیا لە ناو سەدەفدا ٢. *[کینایە]* هەڵکەوتە و بێوێنە 🇮🇷 ١. درّ یتیم ٢. بی‌همتا

**دوڕ**[٢]: ئاوەڵناو. ١. ناوەند؛ ناوەڕاست ٢. هەڵواسراو 🇮🇷 ١. وسط ٢. آویزان

**دوڕاج / duřac**/: ناو. پۆڕ 🇮🇷 دُرّاج

**دوڕاجە / duřace**/: ☜ **دوڕگە**

**دوڕاجی / duřacî**/: ئاوەڵناو. ١. قەرەچی؛ کاولی ٢. دڕاجە؛ دووڕەگە؛ دووڕێژە 🇮🇷 ١. کولی ٢. دورگه

**دوڕاز / duřaz**/: ئاوەڵناو. مُنافق؛ دووڕوو؛ ڕووبین 🇮🇷 مُنافق

**دوڕڕە / duřře**/: ئاوەڵناو. دوڕە؛ دوڕڕەگ: ١. دایک تاژی باوک گەماڵ یان پێچەوانەی ٢. تایبەتمەندی بزنی موو تێکەڵ لە مەرەز و موو 🇮🇷 ١. دورگه (سگ) ٢. ویژگی نوعی بُز

**دوڕڕەگ / duřřeg**/: ☜ **دوڕڕە**

**دوڕشێر / duřşêr**/: ناو. هاس؛ وەرشەق؛ وەرشەک؛ تاژپڵنگ 🇮🇷 یوزپلنگ

**دوڕگە / duřge**/: ناو. دڕگە؛ دوڕاجە؛ دوڕە؛ جزیرە؛ گراف؛ چزیر؛ ئاد؛ وشکایی لە نێوان ئاودا، گچکەتر لە قوڕنە 🇮🇷 جزیره

**دوڕنا / duřna**/: ناو. قازیقولنگ 🇮🇷 دُرنا

**دوڕناس / duřnas**/: ئاوەڵناو. کارزان؛ لە کار زان؛ سەردەرچووگ؛ پسپۆڕ لە بواری کار و زانستەوە 🇮🇷 کارشناس

**دوڕوبا / duřuba**/: ناو. بەردێکی گرانبایی قاوەییە 🇮🇷 سنگی قیمتی

**دوڕە**[١] **/ duře**/: ☜ **دوڕگە**

**دوڕە**[٢]: ☜ **دوڕڕە**

**دوزاخە / duzaxe**/: ناو. وەڕەزی؛ قەڵسی؛ جاڕزی 🇮🇷 پکری

◘ **دوزاخە دان**: وەڕەز کردن؛ جاڕز کردن 🇮🇷 اذیت کردن

**دوزەنە / duzene**/: ناو. چوارچێوە؛ سیستەم 🇮🇷 سیستم

**دوژ**[١] **/ duj**/: ناو. ١. ☜ **دۆژەھ** ٢. گوریس؛ تەناف 🇮🇷 ١. ☜ **دۆژەھ** ٢. ریسمان؛ طناب

◘ **دوژ کێشان**: جۆرێ یاری بەکۆمەڵە، یاریکەران دەبنە دوو بەشەوەوە، گوریسێکی درێژ دێنن هەرکام لە سەرێکەوە دەیکێشن، کام دەستە زۆری پێ بشکێ بەرەو خۆی بێکێشێ، بردوویە 🇮🇷 طناب‌کشی

**دوژ**[٢]: ئاوەڵناو. ١. کز و سیس ٢. ناتەبا؛ دژ 🇮🇷 ١. افسرده؛ پژمرده ٢. ضد

**دوژمان / dujman**/: ☜ **دژمان**

**دوژمن**[١] **/ dujmin**/: ناو. دژ؛ دژمن؛ دژمەن؛ دژمین؛ دشمن؛ دوشمن؛ دوشمە؛ دوشمین؛ دەقەز؛ مدەی؛ گاڤبەر؛ نەتل؛ نەتەل؛ نەتەوی؛ خەنیم؛ مەخرک؛ تاسب؛ مخانە؛ نەدۆست؛ خوێنەخوار؛ خوێنەخوارە؛ خووینەر؛ جاجوو: ١. ئەوەی کە لەمەڕ کەس یان کەسانێکەوە بەدخوازە ‹نایەڵێ دوژمن بە ڕەنگە زەردەکەی من پێکەنێ/ تا دەمی مردن ئەمن مەمنوونی فرمێسکی گەشم «هێمن»› ٢. کەس، گرۆ یان وڵاتێک کە لەگەڵ دیتری لە شەڕ و کێشەدایە ‹... چاوی بڕیبووە دەرفەتێک کە بتوانێ زەبری خۆی تێدا بوەشێنێ و دوژمن لە نیشتمانەکەی خۆی دەرپەڕێنێ «هەژار، شەرەفنامە»› 🇮🇷 ١و٢. دشمن

◘ **دوژمن لە ماڵی کەسێک ناهەق بوون**: *[دوعا]* دەستی دوژمن بە ماڵی کەسێ نەگەیشتن و هەناسە سارد بوونی 🇮🇷 چشم دشمن کور شدن

**دوژمن**[٢]: ئاوەڵناو. دژمن؛ دشمن؛ دژمەن؛ دژمین؛ دوشمن؛ دوشمە؛ دوشمین؛ نەیار؛ ناکۆک و نەساز ‹پیسی، دوژمنی لەش‌ساغییە› 🇮🇷 دشمن

**دوژمنایەتی / dujm(i)nayetî**/: ناو. دژمناتی؛

دژمنایـەتی؛ دوژمـنی؛ دژایـەتی؛ دژمـەنی؛ دوشمنایـەتی؛ دشمـنی؛ نـەیاری؛ لاری؛ نـۆیین؛ بیڤـک: ١. دۆخ یـان چۆنیـەتی دوشمـن بـوون ‹دوای ئـەو ڕووداوە، دۆسـتایەتییەکەی بـوو بـە دوژمنایەتی› ٢. دژبەرایەتی و بەدخوازی ‹وەختـی خۆی لەگەڵـماندا زۆری دوژمنایـەتی کـرد› ≡ ١و٢. دشمنی

**دوژمندار** / dujmindar/: ناوەڵناو. دژمندار؛ نە یەک و نە دوو دوژمن؛ خاوەن دوژمنی زۆر ‹دوژمندار لە سـێبەری خۆیشـی ئەترسـێ «مەسـەل»› ≡ دارای دشمن

**دوژمنی** / dujm(i)nî/: دوژمنی؛ دژمەنی؛ دشمنی: ١. دۆخ یـان چۆنیـەتی دوشمـن بـوون ٢. دژبەرایەتی و بەدخوازی ≡ ١و٢. دشمنی

**دوژمین** / dujmîn/: ☜ دژمان

**دوژوار** / dujwar/: ☜ دژوار

**دوژواری** / dujwarî/: ☜ دژواری

**دوژوێن** / dujwên/: ☜ دژمان

**دوژەنگ** / dujeng/: ↓

▣ **دوژەنگ نیانە یەک:** *[پلار]* تەواو لەڕ و لاواز بوون ≡ سخت ضعیف و لاغر شدن

**دوژێن** / dujên/: ☜ دژمان

▣ **دوژێن دان:** جنێو/ جوێن دان ≡ دُشنام دادن

**دوژێنفرۆش** / dujênf(i)roş/: ناوەڵناو. زمـان‌پـیس؛ جنێوفرۆش؛ سخێف‌بێژ ≡ بدزبان؛ فحاش

**دوساخ**[1] / dusax/: نـاو. دوسـاق: ١. یەخسـیر؛ بەندی؛ زیندانی ٢. گرتووخانە؛ زیندان ≡ ١. اسیر ٢. زندان

**دوساخ**[2]: ناوەڵناو. دوساق؛ گیر؛ قەتیس؛ بێ‌دەرەتان ‹یـە تاکـەی دوسـاخ گێسـووی سـیاتەن/ ئـیرادەت چێشـەن، چـێش موددەعاتـەن؟ «سـەیدی»› ≡ محبوس

**دوساخچی** / dusaxçî/: ناو. دوسـاخوان؛ بەنـدیوان؛ زیندانەوان ≡ زندانبان

**دوساخخانە** / dusaxxane/: نـاو. گرتووخانـە؛ بەندیخانە؛ زیندان ≡ زندان

**دوساخوان** / dusax(i)wan/: ☜ دوساخچی

**دوساق** / dusaq/: ☜ دوساخ

**دوسۆ** / duso/: ☜ دوسۆ

**دوش**[1] / duş/: ☜ دش[1]

**دوش**[2]: ناوەڵناو. گرژ و سیس ≡ افسُردە

▣ **دوش دامان:** ☜ دژ دامان

**دوشاڤ** / duşav/: ☜ دۆشاو

**دوشتە** / duşte/: ناو. زروە؛ درشتەی شت ≡ دُرُشتە

**دوشداماو** / duşdamaw/: ☜ دژداماو

**دوشڤان** / duşvan/: ناوەڵناو. کیناوی؛ قـین لـە دڵ ≡ کینەتوز

**دوشمن** / duşmin/: ☜ دوژمن

**دوشمنایەتی** / duşm(i)nayetî/: ☜ دوژمنایەتی

**دوشمنی** / duşm(i)nî/: ☜ دوژمنی

**دوشمە** / duşme/: ☜ دوژمن

**دوشمین** / duşmîn/: ☜ دوژمن

**دوشەکۆڵە** / duşekołe/: ناو. مەندەر ≡ تُشکچە

**دوعا** / du'a/: ☜ دۆعا

**دوعاخوێن** / du'ax(i)wên/: ناو. نزاخوێن؛ نزاخوان ≡ دُعاخوان

**دوغرمـەودۆ** / doğirme w do/: ناوەڵـناو. *[پلار]* تێکـەڵاوی چەنـد شـتی پێـک ناسـاز ≡ آش شُلەقلمکار

**دوغرمە** / duğirme/: ☜ دۆغرمە

**دوڤ** / duv/: ناو. دووگ؛ دوو ≡ دُنبە

**دوڤدوڤک** / duvduvik/: ☜ دیڤەلان

**دوڤک** / duvik/: ناو. دیڤ؛ کلک؛ دوو ≡ دُم

**دوڤلەرزینک** / duvlerzinik/: ☜ دوهەژینك

**دوڤمەساسە** / duvmesase/: ناو. قشقەڕە؛ قشقەڵە؛ قشقارە ≡ زاغی

**دوڤمەقەسوک** / duvmeqesuk/: ☜ **دومقەس**

**دوڤەلان** / duvelan/: ☜ **دوڤدوڤك**

**دوڤەلانک** / duvelanik/: ☜ **دوڤدوڤك**

**دوقدوقە** / duqdoqe/: ئاوەلناو. بێشەرم و حەیا ≡ بی‌شرم

**دوکان** / dukan/: ☜ **دوکان**

**دوکاندار** / dukandar/: ☜ **دوکاندار**

**دوکتور** / duktur/: ناو. دکتۆر: ١. بژیشک؛ پزیشک؛ حەکیم ٢. کەسێک کە لە بوارێکی زانستیدا سەرترین پلەی زانستگایی هەیە ≡ ١. پزشک ٢. دکتر

**دوکتورا** / duktura/: ناو. دکتۆرا؛ دوکتوری؛ پلەی دوکتور ‹دوکتورای ویژە› ≡ دکترا

**دوکتوری** / dukturî/: ناو. دکتۆری: ١. چۆنیەتی دوکتور بوون ٢. ☜ **دوکتورا** ≡ ١. دکتری ٢. ☜ **دوکتورا**

**دوکتورین** / dukturîn/: ناو. دکتۆرین؛ ئامۆژە ‹دوکتورینی مارکس› ≡ دکترین؛ آموزە

**دوکلە** / dukłe/: ☜ **دوکەڵ**

**دوکوڕ** / dukuř/: ناو. جۆرێ مراوی ≡ نوعی مرغابی

**دوکەڕیسە** / dukeřîse/: ناو. دوکەڕیسە؛ گۆرەوی‌چنە؛ گۆرواباف ≡ چرخ‌ریسک

**دوکەڕێسە** / dukeřêse/: ☜ **دوکەڕیسە**

**دوکێلی** / dukêlî/: ☜ **دوکەڵاوی**

**دوگرد** / dugird/: ناو. دوگور؛ دوگورد؛ دووگرد: ١. بەرماڵ؛ پارچەیەک کە نوێژی لە سەر دەکرێ ٢. دوگردی؛ دوگوردی؛ جۆرێ جاجیم ≡ ١. جانماز ٢. نوعی جاجیم

**دوگردی** / dugirdî/: ☜ **دوگرد_٢**

**دوگم** / dugm/: ئاوەڵناو. بیروشک؛ وشک؛ لایەنگری بیر و بۆچوونی نەگۆڕ ≡ دُگم

**دوگمە** / dugme/: ناو. دگمە؛ دکمە: ١. کلانە؛ پشکوژ؛ قومچە؛ قۆپچە؛ پۆپچە؛ قولۆبچە؛ گژگ؛ کژک؛ پرزانک؛ لیگ؛ لەپگ؛ ئامێرێکی بچووک بۆ هەڵپێکانی جلک یا بۆ جوانی ٢. ئامێرێکی بچووکی زەق و خڕ، بۆ ڕێخستنی کەرستەیەک ‹دوگمەی زەنگ› ≡ ١و٢. دُکمە؛ تُکمە

**دوگمەودۆڵاب** / dugmewdołab/: ناو. زەنبەرێکە لە بن سیخمەوە دەبەسرێ و سنگ بەرز دەکاتەوە ≡ زیوری زیر یلک بندند

**دوگمەوقەیتان** / dugmewqeytan/: ناو. کەنارەی سوخمەی ژنانە ≡ سجاف یلک

**دوگور** / dugur/: ☜ **دوگرد**

**دوگورد** / dugurd/: ☜ **دوگرد**

**دوگوردی** / dugurdî/: ☜ **دوگرد_٢**

**دوگون** / dugun/: ناو. گرێ‌کوێرە ≡ گره کور

**دوگونە** / dugune/: ناو. گیای دووسەر ≡ گیاهی است

**دوگوە** / dugwe/: ناو. دارێکی دوو سەرە بۆ دڕک کوتان ≡ چوب دوشاخەی خارکوبی

**دوگەم** / dugem/: ناو. کووتاڵێ کە لە چادری دەهاڵێنن بۆ گەرم بوون ≡ پارچەای کە گرد خیمە پیچند

**دولاڤ** / dulav/: ناو. دۆڵی ئاش ≡ ناو آسیا

**دولبەر** / dulber/: ☜ **دڵبەر**

**دولفین** / dulfîn/: ناو. گیانەوەری گوانداری ئاوژی بە درێژایی نزیک بە ١,٥ تا ٤,٥ میترەوە کە زۆرتر بە کۆمەڵ لە زەریا و ئوقیانووسەکاندا دەژین، زۆر وریان و زوو کەوی دەبن ≡ دلفین

**دولڤەریسک** / dulverîsik/: ناو. تەشی ڕێسک؛ باڵدارێکە ≡ پرندەای است

**دولکە** / dulke/: ناو. سەروە؛ سەردولکە؛ کاری بە مردوودا هەڵگوتن ≡ نوحە

**دولگە** / dulge/: ناو. هەڵبەستی دلخۆشکەرە ≡ مدیحە

**دوللەک** / dullek/: ☜ **دەڵەک_١**

**دولوول** / dulûl/: ناو. دوولیلی؛ تفەنگی دوولوولە ☰ تفنگ دولول

**دوڵکە** / dułke/: ☜ **دۆڵکە**

**دوڵەم** / dułem/: ناوەڵناو. تەمەڵ؛ تەمبەڵ ☰ تنبل

**دوم** / dum/: ☜ **دم ـ٢**

**دوما** / duma/: ☜ **دوا**

**دومات** / dumat/: ناو. چۆرتمە؛ بەڵا و بەسەرهاتی ناخۆش ☰ بلا؛ مُصیبت

**دومارەکوڵ** / dumarekuł/: ☜ **دمارەکۆڵ**

**دومارِن** / dumařin/: ☜ **دومارِنگ**

**دومارِنگ** / dumařng/: ناو. پاشەرۆک؛ پاشارۆ؛ دومارِن؛ دوویارِنگ ☰ پساچین

**دومان** / duman/: ناو. مژ؛ تەم؛ تومان ☰ مِه

**دوماوەن** / dumawen/: ناو. ماڵ و کەس و کاری زاوا ☰ خانوادەی داماد

**دوماهی** / dumahî/: ☜ **دوایی**

**دومایی** / dumayî/: ☜ **دوایی**

**دومبەڵان** / dumbełan/: ☜ **دمبەڵان ـ٢**

**دومدوک** / dumdûk/: ☜ **دندوك**

**دومدیک** / dumdîk/: ناو. چوکلەقنگە؛ چوکلەعنە؛ پووشبەقنگە؛ پووشبەقوونە؛ زەلەقوون ☰ سنجاقک

**دومدیکە** / dumdîke/: ناو. زەلەقوون؛ پووشبەقوونە؛ زلبەقنگە؛ زلبەقوونە ☰ سنجاقک

**دومرِکانێ** / dum(i)řekanê/: ☜ **دومرەکانێ**

**دومقەس** / dumqes/: ناو. دومقەسک؛ دومقەسوک؛ دومەقەسەک؛ دوومقەس؛ دوڤمەقەسۆک؛ دووڤمەقەسوک؛ پەرِەسلێرکە؛ پەرِەسێلکە؛ پەرِەسێرکە؛ حاجیرِەش؛ هەجهەجک؛ حاجیرِەشک؛ هاجرِەشک ☰ پرستو

**دومقەسک** / dumqesik/: ☜ **دومقەس**

**دومقەسوک** / dumqesuk/: ☜ **دومقەس**

**دومقەسەک** / dumqesek/: ☜ **دومقەس**

**دومل**[١] / dumil/: ☜ **دمەڵ**

**دومل**[٢]: ناوەڵناو. ناوشانپانی مل قەوی ☰ گردن کُلُفت

**دوملانە** / dumlane/: ناو. دوو بەرزایی کە بەینیان قووڵ بێ ☰ دو بلندی کە میانشان گود باشد

**دومڵ** / dumił/: ☜ **دمەڵ**

**دومە** / dumme/: ☜ **دمەك**

**دومەرکۆڵ** / dumerkoł/: ☜ **دمارەکۆڵ**

**دومەقەسەک** / dumeqesek/: ☜ **دومقەس**

**دومەک** / dumek/: ☜ **دمەك**

**دومەکژەن** / dumekjen/: ☜ **دمەكژەن**

**دومەڵ** / dumeł/: ☜ **دمەڵ**

⊡ **دومەڵ دەرکردن**: ☜ **دومەڵ دەرهاتن**

**دومەڵ دەرهاتن**: دومەڵ دەرکردن؛ سەرهەڵدان و پەیدا بوونی دمەڵ ☰ دمل درآوردن

**دومەڵان** / dumełan/: ☜ **دمبەڵان ـ٢**

**دومەڵەک** / dumełek/: ☜ **دمەك**

**دومەڵەکژەن** / dumełekjen/: ☜ **دمەكژەن**

**دومی** / dumî/: ناو. دووگ؛ دوو؛ دمە؛ دوڤ؛ دیڤ؛ دونگ؛ دووڤ؛ تەری؛ ساکەتە؛ کۆمە بەزی ژێر پاشەڵی مەرِ ☰ دُنبه

**دون** / dun/: ناو. ١. دانی مەل و مریشک ٢. چینچک؛ چنچک؛ تووتەک؛ چیچڵە؛ هەڵتووتەک؛ هەڵتروشک؛ ترووشک؛ قوونەڵتس؛ قەلەفیسک؛ دانیشتن لە سەر هەر دوو پێ بە شێوەیەک کە ئەژنۆ رِێکی سینگ بێتەوە ٣. ☜ **دوند** ٤. چرچ و گنجی رِوخسار ☰ ١. دانەی ماکیان ٢. چُمباتمە ٣. ☜ **دوند** ٤. چین و چروک صورت

**دونای** / dunay/: ☜ **دواندن**

**دونبەڵان** / dunbełan/: ☜ **دمبەڵان ـ٢**

**دونبەڵمان** / dunbełman/: ☜ **دمبەڵان ـ٢**

**دوند** / dund/: ناو. دون؛ ترۆپک؛ لووتکە؛ بانترین

شوێنی کێو ‹بۆت نووسیوم بۆت بنووسم ئەمن چیم/ دوندی قەندیل، گۆڕەپانی هەڵگورد نیم «هێمن»› 🇮🇷 قلەی کوە

**دوندول** / dundul/: ناو. کاروانەی وشتر؛ قەتاری وشتر 🇮🇷 کاروان شتر

**دوندوک** / dundûk/: ☜ **دندوك**

**دونده** / dunde/: ☜ **دندە-۱**

**دونگ** / dung/: ناو. دووگ 🇮🇷 دُنبه

**دونگز** / dungiz/: ناو. گیایەکە بنەکەی لە زەویدا وەک دارە، بۆنخۆشە، وردی دەکەن بۆ ناو تووتن بۆنی خۆش دەکا 🇮🇷 گیاهی خوشبو با ریشەی چوبی

**دونگلەفسە** / dung(i)łef(i)se/: ناو. مەلی مالی کە پەڕی کلکی جوێ بۆتەوە 🇮🇷 ماکیانی کە پر از دمش کنده شده

**دونگەمەڕانێ** / dungemeřanê/: ناو. بەزم و یارییەکی لادێییە 🇮🇷 از بازی‌ها

**دونگەنە** / dungene/: ناو. مەڕی قەڵەوی دووگ‌زل 🇮🇷 گوسفند چاق دُنبه بزرگ

**دونیا** / dunya/: ☜ **دنیا**

**دونێ** / dunê/: ☜ **دوێکە**

**دووات** / duwat/: ناو. داوەت؛ زەماوەند 🇮🇷 عروسی

**دووار** / duwar/: ☜ **دەوار-۳**

**دوە** / d(i)we/: ناو. ۱. قەدەم؛ تینی هەتاو کە لە زەوی هەڵدەستێ و دەبینرێ ۲. ئافەتی ڕەز 🇮🇷 ۱. لهیب مانندی کە زیر تابش آفتاب در صحرا دیده می‌شود ۲. آفت انگور

**دوەت** / d(i)wet/: ☜ **دوت**

**دوەر** / d(i)wer/: ناو. دوێت؛ کچ؛ کەنیشک 🇮🇷 دختر

**دوەک** / d(i)wek/: ☜ **دۆك**

**دوەلەپ** / d(i)welep/: ☜ **دوفلیقانە**

**دوهن** / duhn/: ناو. ڕۆن 🇮🇷 روغن

**دوهەژینک** / duhejînik/: ناو. قینلەقنە؛ کلک‌هەڵتەکێنە 🇮🇷 دُم‌جنبانک

**دوهی** / duhî/: ☜ **دوێکە**

**دوی** / duy/: ☜ **دووکەڵ**

**دویت** / d(i)wît/: ☜ **دەیووس**

**دویچە** / d(i)wîçe/: ناو. لەرز لە تا یان لە سەرما 🇮🇷 لرز پس از تب یا از سرما

**دوید** / d(i)wîd/: ناو. دوو؛ دووکەڵ ‹دوید دەماوەن پاتاق تاران/ کەلەی بیستوون ماڵ چووداران «فولکلۆر»› 🇮🇷 دود

**دویر** / d(i)wîr/: ☜ **دوور**

**دویکەڵ** / d(i)wîkêł/: ☜ **دووکەڵ**

**دویکێل** / d(i)wîkêl/: ☜ **دووکەڵ**

**دوین**[1] / d(i)wîn/: چاوگ. دوان؛ قسە کردن 🇮🇷 سخن گفتن

**دوین**[2]: ☜ **دۆینە**

**دوین**[3]: ناوەڵناو. چەور؛ چەڤر 🇮🇷 چرب

**دویندان** / d(i)wîndan/: ناو. دووندا؛ منال 🇮🇷 فرزند

**دوینە** / d(i)wîne/: ☜ **دۆینە**

**دوێ** / d(i)wê/: ناو. ۱. دوو؛ ژمارەیەکی سەرەکی دوای یەک و پێش سێ ۲. ☜ **دوێکە** 🇮🇷 ۱. عدد دو ۲. ☜ **دوێکە**

**دوێت** / d(i)wêt/: ناو. ۱. ☜ **دەوات** ۲. ☜ **دوت**

**دوێتانە** / d(i)wêtane/: ☜ **کچانە**

**دوێتە** / d(i)wête/: ☜ **دوت**

**دوێر** / d(i)wêr/: ناو. ژوور؛ دیو 🇮🇷 اتاق

**دوێرد** / d(i)wêrd/: ناو. دوارد؛ دوێردگ؛ دۆدی؛ دوێردە؛ مقەست؛ مقەس؛ قەیچی؛ تۆرتۆ 🇮🇷 قیچی

**دوێردگ** / d(i)wêrdig/: ☜ **دوێرد**

**دوێردە** / d(i)wêrde/: ☜ **دوێرد**

**دوێز** / d(i)wêz/: ناو. دز؛ ماڵبڕ 🇮🇷 دزد

**دوێشەو**[1] / d(i)wêşew/: ناو. دوێنێشەو؛ دووشینا؛ دیشەو؛ شەوی پێش ئەمشەو ‹دوێشەو شەوی دووشەمبە بوو› 🇮🇷 دیشب

**دوێشەو**[٢]: ئاوەلکار. دوێنێ‌شەو؛ دووشینا؛ دیشەو؛ لە شەوی پێشوودا ‹دوێشەو باران باری› ☚ دیشب

**دوێکە**[١] / d(i)wêke/: ناو. دوێنێ؛ دوێنێکە؛ دونێ؛ دوهی؛ دۆ؛ دۆها؛ دوێ؛ دووش؛ دینیا؛ دێنێ: ١. ڕۆژی پێش ئەمڕۆ ٢. سەر بە ڕابردوو ‹ئەم جۆرە بیر و بڕوایانە هی دوێکە بوون، ئەوڕۆ خەڵک چاویان کراوەتەوە› ☚ ١و٢. دیروز

**دوێکە**[٢]: ئاوەلکار. دوێنێ؛ دوێنێکە؛ دونێ؛ دوهی؛ دۆ؛ دۆها؛ دوێ؛ دووش؛ دێنێ؛ دینیا: ١. لە ڕۆژی پێشوودا ‹دوێکە چیم بگریم ئوتاقیک وە جای/ وەتم بکیشم بیلا دەنگم نای «شامی»› ٢. لە ڕابردوویەکی نزیکدا ‹دوێکە ئاغە بووی ئیمڕۆ نۆکەری/ دوێکە لە سەر سەر، ئیمڕۆ سەرخەری! «فولکلۆر»› ☚ ١و٢. دیروز

**دوێڵ** / d(i)wêł/: ناو. ١. زوێڵ؛ پارچەی باریک لە چەرم ٢. تەڵەزمە بەرد ٣. دۆڵ؛ شیو؛ گەلی ☚ ١. نوار چرمی ٢. پُلمه ٣. درّه

**دوێڵبەن** / d(i)wêłben/: ناو. کاری داپۆشینی میچ بە تەڵەزمە بەرد ☚ عمل پوشانیدن سقف با پُلمەسنگ

**دوێن**[١] / d(i)wên/: ناو. ١. قسە؛ گفت ٢. قسەکەر؛ بێژەر ☚ ١. تکلُم ٢. مُتکلم

▪ **دوێن**[٢]: پاشەوشە. گفت؛ بەیان ‹دژدوێن؛ کەم‌دوێن› ☚ ـ حرف؛ ـ سخن

**دوێنێ** / d(i)wênê/: ☜ **دوێکە**

**دوێنێ‌شەو** / d(i)wênêşew/: ☜ **دوێشەو**

**دوێنێکە** / d(i)wênêke/: ☜ **دوێکە**

**دۆ** / do/: ناو. ١. دەو؛ دوو؛ ماستاوی لە مەشکەدا ژەنراوی کەرە لێ گیراو ‹کەس بە دۆی خۆی نالێ ترش «مەسەل»› ٢. کیژێ کە لە هەڵپەڕکێدا دێتە دەستی لاو ‹دێم و دەگرم بازی بێری شۆخ و شەنگ/ دێم و دەگرم دەستی دۆی جوان و چەلەنگ «هێمن»› ٣. ڕا؛ غار؛ کار و ڕەوتی ڕاکردن ٤. دوێنێ؛ دوێکە ☚ ١. دوغ ٢. دختر هم‌رقص ٣. دو؛ عمل دویدن ۴. دیروز

▣ **دۆ و دۆشاو تێکەڵ کردن**: /کنایه/ زمان نەپاراستن و هیچی تێدا نەهێشتنەوە بە هۆی تووڕەیی زۆرەوە ☚ قات زدن

**فـو لـە دۆ کـردن**: /کنایـه/ تێـدا ڕامـان؛ هەڵسەنگاندن و بیر کردنەوە ☚ تأمل کردن

**دۆبردە** / dobirde/: ناو. جۆرێک نەخۆشی پاتاڵ ☚ از بیماری‌های دام

**دۆبـڕ** / dobiř/: ئاوەلـناو. /کنایـه/ دۆبـڕە؛ جووت‌قۆشەی بێ‌فەڕ ☚ نحس؛ شوم

**دۆبڕە**[١] / dob(i)ře/: ناو. لەیستۆکێکی منداڵان ☚ نوعی اسباب‌بازی

**دۆبڕە**[٢]: ☜ **دۆبڕ**

**دۆبژێن** / dobjên/: ناو. هەرچی پێی دادەبێژن ☚ الک

**دۆبە** / dobe/: ناو. ١. بەرەمۆم؛ خشت و خاڵی هەنگوین ٢. هەنگوینی قاڵ‌کراو ☚ ١. آشغال عسل ٢. عسل صاف‌شده

**دۆبەسەرە** / dobesere/: ناو. گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ ☚ از گیاهان دارویی

**دۆبەلان** / dobełan/: ☜ **دمبەلان-٢**

**دۆبیە** / dob(i)ye/: ناو. دۆبە؛ ڕنگاڵ؛ شیلە ☚ شیره؛ شهد

**دۆپ**[١] / dop/: ناو. ١. شیو؛ شیوەڵە؛ دۆڵ؛ گەلی؛ گەلی ٢. لەوەڕگە ☚ ١. درّه ٢. چراگاه

**دۆپ**[٢]: ئاوەلناو. نەوی؛ نزم؛ کۆتا ☚ پست

**دۆت** / dot/: ☜ **دوت**

**دۆتمام** / dotmam/: ناو. کچی مام ☚ دختر عمو

**دۆتن** / dotin/: ☜ **دۆشین**

**دۆتـەڵـەمیران** / dotełemîran/: نـاو. تەتڵـەمیران؛ کرمێکی تووکنی گیاخۆرە ☚ نوعی کرم گیاهخوار کُرکدار

**دۆتی / dotî/:** ☜ **دۆشراو**

**دۆچ / doç/:** ناو. گیایەکی چەن‌سالانە، ٦٠-٢٠ سانتی‌میتر بالا دەکا، گەلای باریک و نووک‌تیژ و کولکنە گولی زەردی بۆنخۆش دەگرێ ☰ شیرپنیر

**دۆچن[1] / doçin/:** ناو. ١. پێستەی خۆشەکراو بۆ هەلگرتنی دۆ ٢. ئەو دۆیەی بەو شێوە هەلدەگیردرێ ☰ ١. کیسەی پوستی ویژەی نگهداری دوغ ٢. دوغی کە در چنین کیسەای نگهداری می‌شود

**دۆچن[2]:** ئاوەلناو. لۆچن؛ لیچق و بە تایبەتمەندی لکانەوە ☰ لزج و چسبندە

**دۆخ[1] / dox/:** ناو. ١. چۆنیەتی؛ چلۆنەتی؛ بار ٢. هەرەت؛ جەنگە ٣. دووخ؛ تیری کەوان ☰ ١. چگونگی؛ حالت ٢. موسم ٣. تیرِ کمان

◘ **دۆخ هەمان دۆخ بوون:** بارودۆخ بە هەمان شێوەی پێشوو بوون ☰ در بە روی همان پاشنە چرخیدن

**دۆخ[2]:** ئاوەلناو. ١. توون؛ توند لە تامدا ٢. تەراز؛ بەرانبەر ☰ ١. تُندمزە ٢. میزان و برابر

**دۆخاو / doxaw/:** ☜ **دۆغاو**

**دۆخاوە / doxawe/:** ☜ **دۆکولیو**

**دۆختە / doxte/:** چاوگ. دۆشین؛ دۆتن ☰ دوشیدن

**دۆخڕشمە / doxřişme/:** ☜ **دۆخڕەشمە**

**دۆخڕەشمە / doxřeşme/:** ناو. دۆخڕشمە؛ دەسکەوسار ☰ افسار

**دۆخمە / doxme/:** ☜ **دەخمە**

**دۆخوا / doxwa/:** ☜ **دۆکولیو**

**دۆخورمە / doxurme/:** ناو. خواردنێکە، نانەڕەقە دە ناو ڕۆن و دۆشاو دەکوشن و دەیکولێنن ☰ نوعی غذا

**دۆخوین / dox(i)wîn/:** ☜ **دۆخین**

**دۆخۆر / doxor/:** ناو. دۆخە؛ ئاژەلی بە ئامانەت کە لە بەرامبەر ڕاگرتنی، شیری بخۆن و لە ماوەی خۆیدا بیدەنەوە خاوەنی ☰ دام امانتی کە بهرەاش را بخورند و سپس برگردانند

**دۆخە / doxe/:** ناو. ١. ☜ **دۆخۆر** ٢. سەرەگێژە ☰ ١. ☜ **دۆخۆر** ٢. سرگیجە

**دۆخەرێ / doxerê/:** ناو. جۆرێ گەمەی جگ ☰ نوعی بازی با شتالنگ

**دۆخەستە / doxeste/:** ناو. دڕوولە؛ گیادۆ ☰ نوعی سبزی آش

**دۆخەوا / doxewa/:** ☜ **دۆکولیو**

**دۆخیان / doxyan/:** ناو. دوخیانەت؛ هەڕەت؛ هەڕەمە؛ جەنگە ☰ موسم؛ عنفوان

**دۆخین / doxîn/:** ناو. دوخین؛ دۆخوین؛ دۆخێن؛ دێخوون؛ بنەخوێن؛ بەندۆخین؛ بەندەخوێن؛ بەندەهوون؛ بەندێخوون؛ بەنەخوێن؛ بەنەخوون؛ بەن‌شوالێن؛ هۆجەنە ☰ بند شلوار

◘ **دۆخین پسانن:** *[کینایە]* بە زۆر لاقە کردن ☰ تجاوز کردن

**دۆخین پێ شل کردن:** خۆفرۆشی پێ کردن ‹ئیحتیاج دۆخینی پێ شل کردەوە/ شەرم و ناموسی لە بیری بردەوە «هێمن»› ☰ بە خودفروشی واداشتن

**دۆخینی کەسێک بە حەرام کرانەوە:** *[کینایە]* ئەهلی گەندەلی جنسی بوون ☰ اهل فساد جنسی بودن

**دۆخین‌شل / doxînşil/:** ئاوەلناو. *[کینایە]* بێ‌ناموس ☰ بی‌ناموس

**دۆخێن / doxên/:** ☜ **دۆخین**

**دۆد / dod/:** ناو. ١. کالان؛ کالانە؛ گلادە؛ قەلادە؛ قەلاتە؛ قەلادە؛ قەرێتە؛ دۆدک؛ شەباک؛ ملقان؛ ئالقە و زەنجیرێ کە دەیکەنە ملی سەگ و دڕندەوە ٢. ☜ **دوت** ☰ ١. قلادە ٢. ☜ **دوت**

**دۆدانە / dodane/**: ناو. دوانە؛ دۆوانە؛ دەوانە؛ حندۆلی؛ مەشکۆڵەی دۆ؛ کیسەی کەتانی یان پێستەی تایبەتی دۆ تێ‌کردن ≡ کیسەی کتانی یا چرمی دوغ

**دۆدک / dodik/**: ناو. ١. ☜ **دۆد** ٢. گەردانە ≡ ١. ☜ **دۆد** ٢. گردنبند

**دۆدی / dodî/**: ☜ **دوێرد**

**دۆدیوبۆدی / dodîwbodî/**: ناو. فێڵ و تەڵەکە؛ تەفرە و گزی ‹لێی کردمە دۆدیوبۆدی و لە دەستی دەرهێنام!› ≡ حُقّەبازی

**دۆدێ / dodê/**: اسم. دایکە؛ وشەی دواندنی دایک ≡ مامان

**دۆر / dor/**: ناو. ١. دەور؛ پەڕانپەڕ ٢. دەوران؛ زەمانە ٣. کاری کلۆش بۆ گێرە هاویشتن ≡ ١. پیرامون ٢. زمانە ٣. عمل پهن کردن غلە برای کوبیدن

**دۆراخ / dorax/**: ناو. بەلبەنی؛ پەلپینە ≡ گیاهی است

**دۆراندۆر[١] / dorandor/**: ناو. دۆرمادار؛ دۆرمادۆر؛ دۆرمەدۆر؛ دەوراندەور؛ دۆن؛ بۆردۆر؛ هۆرە؛ گڕ؛ دەور؛ پەڕانپەڕ؛ هەڤێرکە؛ کشت‌وکنار؛ گردوپەڕ ≡ پیرامون

**دۆراندۆر[٢]**: ناوەڵناو. دەوروبەر؛ گردای‌گرد؛ دەور ‹دیواری دۆراندۆر› ≡ پیرامونی

**دۆراندۆر[٣]**: ناوەڵکار. دەوراندەور؛ لە دەور و بەر؛ دەورتادەور؛ لە گردای گرد؛ قەراخ‌بێچاخ ‹دۆراندۆر بیدوورەوە› ≡ پیرامون

**دۆربەند / dorbend/**: ناو. چوارچێوە ≡ چارچوب

**دۆرپشت / dorpişt/**: ناو. بڕبڕاگە؛ مۆرەغە؛ کرکپشت ≡ ستون فقرات

**دۆرژنگ / dorjing/**: ناو. دۆرنج؛ سیان؛ تەنی؛ قورمی میچ کە شۆڕ دەبێتەوە ≡ دودەی آویزان

**دۆرمادار / dormadar/**: ☜ **دۆراندۆر**

**دۆرمادۆر / dormador/**: ☜ **دۆراندۆر**

**دۆرمەدۆر / dormedor/**: ☜ **دۆراندۆر**

**دۆرنج / dorinc/**: ☜ **دۆرژنگ**

**دۆرەمەڕ / doremeř/**: ناو. بێری؛ مەڕدۆش ≡ گوسفنددوش

**دۆری / dorî/**: ناو. ١. دۆریە؛ گندۆر؛ قەلەندۆر؛ گیایەکی بالابەرزی لاسک شیرینە ٢. ☜ **دەوری** ٣. قوماشێکی تەنکە دەکرێتە دەسماڵ ≡ ١. گیاهی است ٢. ☜ **دەوری** ٣. پارچەای نازک

**دۆریخە / dorîxe/**: ناو. جۆرێ سەوزەی خواردنی گەلاورد ≡ نوعی سبزی خوردنی

**دۆریش / dorîş/**: ناو. ١. ☜ **دەروێش** ٢. تاژیلە؛ حوشترخوا؛ تاجیلۆکە؛ کولەحاجی؛ تاجی ئەحمەدڕاوکەرە ≡ ١. ☜ **دەروێش** ٢. آخوندک

**دۆریشی / dorîşî/**: ناو. تاژیلۆکە؛ تاجیلۆکە؛ تاژیلە؛ تانجی‌پێغەمبەرە ≡ آخوندک

**دۆرینگ / dorîng/**: ناو. مەودا؛ نێوان ≡ فاصله

**دۆریە / dor(i)ye/**: ☜ **دۆری-١**

**دۆرێش / dorêş/**: ☜ **دەروێش**

**دۆرێیە / dorêye/**: ناو. گندۆرە؛ قەلەندۆر؛ گیایەکی بالابەرزی لاسکی شیرینە ≡ گیاهی ساقە شیرین

**دۆڕان / dořan/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //دۆڕای؛ دەدۆڕێی؛ بدۆڕێ// دۆڕیان؛ دانیان؛ دانان ‹سەر و ماڵ و کەماڵ و بیر و هۆشم/ لە نەردی عیشقی تۆدا پاکی دۆڕا «هێمن»› ≡ باختن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: دۆڕاو/ چاوگی نەرێنی: نەدۆڕان

**دۆڕاندن / dořandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //دۆڕاندت؛ دەدۆڕێنی؛ بدۆڕێنە// ١. لە گەمە یان قوماردا دانان ٢. هێلکە ون کردنی مریشک ≡ ١. باختن ٢. تخم گم کردن مُرغ

■ ناوەڵناوی بەرکاری: -/ چاوگی نەرێنی: نەدۆڕاندن

**دۆڕاو** / dořaw/: ئاوەڵناو. دۆڕیاگ؛ دانراو؛ دانیـاو ▤ باخته

**دۆڕک** / dořik/: نـاو. جۆریَ کولێره ▤ نـوعی گـرده نان

**دۆڕیاگ** / dořyag/: ☜ **دۆڕاو**

**دۆڕیان** / dořyan/: ☜ **دۆڕان**

**دۆز**[1] / doz/: نـاو. ۱. مەرام؛ مەبەست ۲. تۆڵە؛ تۆڵ ▤ ۱. هدف؛ مرام ۲. انتقام

◘ **دۆز کردن**: خواستن؛ داوا کردن ▤ خواستن

**ـ دۆز**[2]: پاشەوشـە. ۱. دۆزەر؛ دۆزەرەوە ‹چـارەدۆز؛ ناندۆز› ۲. ـ دوور ‹دۆلدۆز؛ کەوشدۆز› ▤ ۱. یابنـده ۲. دوزنده

**دۆزاک** / dozak/: ناو. شەیتان ▤ شیطان

**دۆزان** / dozan/: ☜ **دوزان**

**دۆزران** / dozran/: چـاوگ. دۆزیان؛ کاری گەڕان و دۆزین لە سەر شتیَ ئەنجام دان ▤ جستجو شدن

**دۆزرانـــەوە** / dozranewe/: چـــاوگ. تێنەپـــەڕ. //دۆزرایەوە؛ دەدۆزرێیەوە؛ بـدۆزرێوە// کەوتنـە بـەر چاو یان لیَ دەرکەوتن و پەیـدا بـوونی شـت یـا بابەتی شاراوە و گومبوو ▤ پیدا شدن

■ ئاوەڵناوی بـەرکاری: دۆزراوەوە/ چـاوگی نـەرێنی: نەدۆزرانەوە

**دۆزراوە** / dozrawe/: ئاوەڵـناو. دۆزیاگـەوە؛ گـومی پەیدا بوو ▤ پیداشده

**دۆزەخ** / dozex/: ☜ **دۆژەه**

**دۆزەخە** / dozexe/: نـاو. دۆزەقـە: ۱. شـوێنیَ کـە ئاوی ئاشی لیَ دەردەچیَ ۲. توونی گەرماو ▤ ۱. مخرج آب آسیا ۲. آتشدان حمام

**دۆزەخی** / dozexî/: ناو. وەیلی ▤ جهنمی

**دۆزەق** / dozeq/: ☜ **دۆژەه**

**دۆزەقە** / dozeqe/: ☜ **دۆزەخە**

**دۆزەنە** / dozene/: ناو. سەرجەمی داب و دەستوور و نـەریتی پێکهێنـەری دەزگایـەک ‹دۆزەنـەی سروشت› ▤ نظام؛ چهارچوب

**ـ دۆزی** / dozî-/: پاشەوشـە. خوازی ‹خوادۆزی› ▤ ـ خواهی؛ ـ یابی

**دۆزیاگەوە** / dozyagewe/: ☜ **دۆزراوە**

**دۆزیان** / dozyan/: ☜ **دۆزران**

**دۆزین** / dozîn/: چاوگ. ۱. پشـکنین؛ گـەڕان بـە دوای شتێکدا، بەتایبەت سپیَ ‹لامل چرچ و لـۆچ، هەموو کـووڕە پشـت/ خۆیـان ئـەدۆزی و ئەسـپێیان ئەکوشـت «قـانع»› ۲. دۆزینـەوە؛ دیتنـەوە؛ پـەیا کردن ۳. دۆزینەوە؛ پەیدا کردنی شتی گومبوو ▤ ۱. گشتن ۲. یافتن ۳. بازیافتن

**دۆزینەوە** / dozînewe/: ☜ **دۆزین-۲**

**دۆژ** / doj/: نـاو. ۱. نێوان؛ مەودا ۲. ئاگر؛ ئاور ▤ ۱. فاصله ۲. آتش

**دۆژزر** / dojzir/: ☜ **دۆژەزەر**

**دۆژە** / doje/: ☜ **دۆژەه**

**دۆژەدەر** / dojeder/: ناو. دۆژەک؛ زامی بـە کـیم و هەوا ▤ زخم چرکین

**دۆژەزەر** / dojezer/: ناو. دۆژزر؛ دۆژەکا؛ دۆزەقـەی ئاش ▤ مخرج آب آسیاب

**دۆژەک** / dojek/: نـاو. دۆژەدەر؛ زامـی بـە کـیم و هەوا ▤ زخم چرکین

**دۆژەکا** / dojeka/: ☜ **دۆژەزەر**

**دۆژەن** / dojen/: نـاو. ۱. لاویَ کـە زۆر هـەوای ژن هێنانی لە سەر بیَ ۲. دۆژەنـک؛ داریَ کـە دۆی پـیَ تێـکوەردەدەن ▤ ۱. جـوان بیتـاب ازدواج ۲. چوبک دوغ به هم زدن

**دۆژەنک** / dojenik/: ناو. ۱. ☜ **دۆژەن-۲** ۲. ☜ **دۆژەنگ-۱**

**دۆژەنگ** / dojeng/: نـاو. ۱. دۆژەنـک؛ دۆژەنگـە؛ داریَ کە دەخرێتە ناو لوولەپی مەشکە ۲. گنجـی تەوێڵ و ژێر برۆ ▤ ۱. چوب زبانەدار مَشک ۲. چـین پیشانی و زیر ابرو

**دۆژەنگە / dojenge/**: ناو. ١. ☜ **دۆژەنگ ـ١** ٢. دۆی بە مەشکە ژەنراو ١. ☜ **دۆژەنگ ـ١** ٢. دوغ مشک

**دۆژەه / dojeh/**: ناو. دوژ؛ دۆژە؛ دۆزەخ؛ دۆزەق؛ دووزەق؛ جەحەندەم؛ ئارتوون دوزخ

**دۆژین / dojîn/**: ئاوەڵناو. گەمار؛ چڵکن چرکین

**دۆس[1] / dos/**: ناو. ١. ☜ **دۆست** ٢. گراوی؛ ماشۆق؛ ژن یا پیاوێ کە پیاو یا ژنێ عاشقییەتی ٣. [کینایە] خودا؛ خوا؛ خودێ ‹شەوەن، خەڵوەتەن، ماڵ بێئەغیارەن/ ئاڵەم گرد وتەن، دۆس خەبەردارەن «بێسارانی»› ١. ☜ **دۆست** ٢. معشوق ٣. خدا

**دۆس[2]**: ☜ **دۆست[2]**

**ـ دۆس[3]**: ☜ **دۆست[3]**

**دۆساخ / dosax/**: ☜ **دەرساخ**

**دۆسایەتی / dosayetî/**: ☜ **دۆستایەتی**

**دۆست[1] / dost/**: ناو. دۆس؛ هەواڵ؛ ئاواڵ؛ هەڤاڵ؛ هاولف؛ هەڤرێ؛ هاورێ؛ هەمباز؛ کەسێ کە دەیناسن، خۆشیان دەوێ و ڕەحمیان بۆی دەچێ و لێی دڵنیان ‹هەزار دۆست کەمە، دوژمنێک زۆرە «مەسەل»› دوست

▣ **دۆستی سەر کاسە**: [کینایە] دۆستی نانی؛ دۆستی ڕواڵەتی و هی کاتی خۆشی دغل‌دوست

**دۆستی گیانی**: [کینایە] دۆستی بەڕاستی دوست جانی

**دۆستی نانی**: ☜ **دۆستی سەر کاسە**

**دۆست[2]**: ئاوەڵناو. دۆس؛ یار؛ هۆگر؛ پشتیوان؛ لایەنگر؛ خاوەن پەیوەندیەکی دۆستانە ‹وڵاتی دۆست› دوست

**ـ دۆست[3]**: پاشەوشە. ـ دۆس؛ ـ خواز؛ حەز ‹ژن‌دۆست؛ پارەدۆست› ـ دوست؛ ـ پرست

**دۆستان / dostan/**: ناو. سێ پایەی ئاسنی سەر ئاگر سەپایەی آهنی روی آتش

**دۆستانی / dostanî/**: ☜ **دۆستایەتی**

**دۆستایەتی / dostayetî/**: ناو. دۆسایەتی؛ دۆستانی؛ دۆخ یان چۆنیەتی هەواڵ بوون ‹تا دووکەڵ لە سەر مەتبەق دیارە/ دۆستایەتیمان هەر بەرقەرارە! «مەسەل»› دوستی

**دۆستک / dostik/**: ناو. ماشۆق؛ ژن یا پیاوێ کە پیاو یا ژنێ عاشقیەتی معشوق

**دۆست و دۆ / dost û do/**: ناو. [کینایە] کەس‌وکار؛ دۆست و خزم کس‌وکار

**دۆستی / dostî/**: ناو. دۆسی؛ دۆستایەتی دوستی

**دۆسوێر / dos(i)wêr/**: ☜ **دۆسۆڵ**

**دۆسۆڵ / dosoł/**: ناو. دۆسوێر؛ هەسانە دوغ چکیده

**دۆسی / dosî/**: ☜ **دۆستی**

**دۆسیە / dos(i)ye/**: ناو. پەروەندە؛ فایل؛ هەڤنڤیس پرونده

**دۆش[1] / doş/**: ناو. ١. ناوشان؛ مل ٢. گۆشتی لای سەرووی ڕانی مەڕ ١. دوش؛ کتف ٢. گوشت انتهای ران گوسفند

▣ **دۆش دابردن**: ☜ **دۆش دامان**

**دۆش دامان**: [کینایە] دۆش دابردن؛ دامان و مات بوون ‹بۆچی عاجزی؟ بۆ دۆش داماوی؟/ خەریک پیلانی کام لێقەوماوی؟ «قانع»› درماندن و پکر شدن

**ـ دۆش[2]**: پاشەوشە. ١. دۆشەر ‹مەڕدۆش› ٢. ئامرازی تێدۆشین ‹گادۆش› ١و ٢. ـ دوش

**دۆشاب / doşab/**: ☜ **دۆشاو**

**دۆشان / doşan/**: ☜ **دۆشین**

**دۆشانی / doşanî/**: ئاوەڵناو. دۆشەنی؛ دۆشیدەنی؛ دۆکردە؛ شیاوی دۆشین دوشیدنی

**دۆشاو / doşaw/**: ناو. دوشاف؛ دۆشاف؛ دۆشاب؛ دیشاف؛ دیشاو؛ شۆک: ١. ئاوی کوڵاوی میوەی شیرین ٢. ئاوی تریی کوڵاو ٣. ڕوب؛ ڕب ٤. شیلەی تووی کوڵاو ‹دۆشاوی هەورامان› ١. شیره ٢.

دوشاب؛ شیرەی انگور ٣. رُب ٤. شیرەی توت

**دۆشاوساز** / doşawsaz/: ناو. کامووک؛ دمس چێکەر 🇮🇷 شیرەی انگورساز

**دۆشاومژ** / doşawmij/: ☜ **دۆشاومژە**

**دۆشاومژە** / doşawm(i)je/: ناو. دۆشاومژ؛ شادە؛ قامکەشادە؛ دووهەمین قامک کە کەوتۆتە پەنای ئەنگوستە گەورەوە 🇮🇷 انگشت سبّابه

**دۆشاوی**[1] / doşawî/: ناو. ١. جۆرێ ترێ ٢. ڕەنگی سووری تاریک 🇮🇷 ١. نوعی انگور ٢. قرمز سیر

**دۆشاوی**[2]: ئاوەڵناو. ١. بە ڕەنگی سووری تاریک ٢. بە دۆشاوەوە تلاو 🇮🇷 ١. قرمز سیر ٢. آغشته به دوشاب

**دۆشای** / doşay/: چاوگ. دۆشین 🇮🇷 دوشیدن

**دۆشتەی** / doştey/: چاوگ. دۆشین 🇮🇷 دوشیدن

**دۆشران** / doşran/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //دۆشرای؛ دەدۆشرێی؛ بدۆشرێ// شیر لێ دەرهێنان بە هۆی گوشینی گوهانەوە 🇮🇷 دوشیده شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: دۆشراو/ چاوگی نەرێنی: نەدۆشران

**دۆشراو** / doşraw/: ئاوەڵناو. دۆتی؛ دۆشیاگ 🇮🇷 دوشیده

**دۆشک** / doşik/: ☜ **دۆشەك**

**دۆشکە** / doş(i)ke/: ☜ **دۆشەك**

**دۆشگ** / doşig/: ☜ **دۆشەك**

**دۆشەک** / doşek/: ناو. دۆشک؛ دۆشگ؛ دۆشەگ؛ دۆشەکە؛ نالیک؛ ڕۆنیشتەک؛ متێل؛ مرتێل؛ ڕایەخی نەرم بۆ لە سەر خەوتن 🇮🇷 تُشک

**دۆشەکچە** / doşekçe/: ☜ **دۆشەکۆڵە**

**دۆشەکۆڵە** / doşekołe/: ناو. دۆشەکچە؛ دۆشەکەڵە؛ مەندەر؛ دۆشەکی پچووک 🇮🇷 تُشکچه

**دۆشەکە** / doşeke/: ☜ **دۆشەك**

**دۆشەکەڵە** / doşekełe/: ☜ **دۆشەکۆڵە**

**دۆشەگ** / doşeg/: ☜ **دۆشەك**

**دۆشەنی** / doşenî/: ☜ **دۆشانی**

**دۆشیاگ** / doşyag/: ☜ **دۆشراو**

**دۆشیدەنی** / doşîdenî/: ☜ **دۆشانی**

**دۆشین** / doşîn/: چاوگ. تێپەڕ. //دۆشیت؛ دەدۆشی؛ بدۆشە// دۆتن؛ دۆشان؛ شیر لە گوان دەرهێنان 🇮🇷 دوشیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەدۆشین

**دۆعا** / do'a/: ناو. دوعا: ١. نقا؛ نزا؛ گاز؛ وتەگەلێک کە بۆ خواستنی شتێک، ڕوو بە خودا و برێ جار پێغەمبەر و پیرۆزان دەگوترێ ٢. نووشتە 🇮🇷 ١و٢. دُعا

⊡ **دۆعا بۆ کردن**: داوای خەیر و خۆشی بۆ کردن 🇮🇷 دُعا کردن

**دۆعا کردن**: ١. لاڵیانەوە لە خودا و داوای شتێ لێ کردن ٢. داوای شەڕ بۆ کەسێ کردن 🇮🇷 ١. نیایش کردن ٢. نفرین کردن

**دۆعای خەیر کردن**: داوای خەیر و خۆشی بۆ کردن 🇮🇷 دُعا کردن

**دۆعای شەڕ کردن**: داوای شەڕ کردن 🇮🇷 نفرین کردن

**دۆغان** / doğan/: ناو. مەلێکی ڕاوکەرە 🇮🇷 پرندەای شکاری

**دۆغاو** / doğaw/: ناو. دۆخاو؛ دووغاو؛ دۆغاوە؛ گێچاو؛ شووروارێژ؛ تێکەڵاوێکی ئاهەک و گەچ یان سیمان لەگەڵ ئاو کە لە بەناییدا بە کار دەچێ 🇮🇷 دوغاب

**دۆغاوە** / doğawe/: ☜ **دۆغاو**

**دۆغرامە** / doğrame/: ☜ **دۆغرمە**

**دۆغرمە** / doğirme/: ناو. دوخرەمە؛ دۆغرامە؛ دۆغرەمە؛ دۆغورمە؛ دوغرمە؛ تریت؛ خواردنێکی فێنکە، لە ماست، پیاز، سەوزی، مەویژ و جاروبار نانەڕەقەشی تێ دەکوشن 🇮🇷 سالاد خیار و ماست

**دۆغرەمە** / doğreme/: ☜ **دۆغرمە**

**دۆغری / doğrî/**: ناو. قسەی ڕاست ☰ سخن درست

**دۆغورمە / doğurme/**: ☚ **دۆغرمە**

**دۆغەوا / doğewa/**: ☚ **دۆکولیو**

**دۆق / doq/**: ناو. ۱. گوڵەباتوون کـە لـە پـەراویزی عابا و برێ جلکی تری دەدروون ۲. عیشـت؛ زللە لە پشتەمل ۳. گۆپـاڵ؛ داردەسـتی ئەسـتوور ٤. مادامی ڕەش ٥. دۆخ؛ چۆنیـەتی؛ چلۆنـەتی؛ بـار ‹قەسەم بە تۆ، قەسـەم بـە نـاز، قەسـەم بـە جـوانی/ هەموو هەستیم دەچێتەوە دۆقی جـارانی «گـۆران»› ☰ ۱. بافتەی سیمی حاشیەی لباس ۲. پس‌گردنی ۳. چُماق ۴. متقال سیاه ۵. حالت؛ چگونگی

**دۆقلمەر / doqilmer/**: ئاوەڵناو. نێوان‌تێکدەر؛ شۆفار ☰ سخن‌چین

**دۆقلێشە / doqłêşe/**: ناو. گیایەکە وەک ئالەکۆک، بزن بنەکەی دەخوا ☰ گیاهی است

**دۆک / dok/**: ناو. دۆوک؛ دۆوەک؛ دوەک: ۱. تلفی ڕۆنی داغ‌کراو ۲. دۆکە؛ شـۆکە؛ سـپیایی بـەلای گیا ☰ ۱. دُرد روغن تفیده ۲. سپیدک؛ آفت گیاهی

**دۆکانە / dokane/**: ☚ **دەموکانە**

**دۆکردە / dokirde/**: ☚ **دۆشانی**

**دۆکلیو / dok(i)łîw/**: ☚ **دۆکولیو**

**دۆکولیو / dokułîw/**: نـاو. دۆکلیو؛ دۆخەوا؛ دۆخوا؛ دۆغەوا؛ دۆخاوە؛ دانەدۆ؛ دەوین ‹قاورمە لـە جێـی گۆشت دائەنرا/ بە کەشک تامـەزرۆی دۆکولـیو ئـەدرا «پیرەمێرد»› ☰ دوغبا؛ آش دوغ

**دۆکە / doke/**: ☚ **دۆک ـ۲**

**دۆکەشک / dokeşk/**: نـاو. ئاوی کەشکی سـاویاو ☰ دوغ کشک

**دۆل / dol/**: ناو. ۱. بێچـوو؛ نـەوە و نـەوەچرک ۲. دۆڵ؛ گەلی ۳. تل؛ خلۆر ☰ ۱. بچە ۲. درّە ۳. غلت

⊡ **دۆل کرن**: تلاندنەوە؛ خلۆر کردنەوە ☰ غلتاندن

**دۆلاب / dolab/**: ☚ **دەولاب**

**دۆلاڤ / dolav/**: ☚ **دۆلاو**

**دۆلک / dolik/**: ناو. شیوەڵە؛ دۆڵی گچکە ☰ درّەی کوچک

**دۆلکان / dolkan/**: ئاوەڵناو. لار؛ خوارەکە و پێچەکە ☰ اریب؛ کج

**دۆلکە / dolke/**: ناو. دولکە؛ دەفـری سەرئاواڵـەی لێودار بۆ ئاو ☰ نوعی پارچ

**دۆلگ / dolig/**: نـاو. پێست؛ مرت؛ قـولاخ؛ کـەوڵ؛ دەرەکی‌ترین بەشی جەستەی مرۆڤ و گیانداران ☰ پوست

**دۆلوێز / dolwêz/**: ئاوەڵناو. دارەڵۆز؛ هەڵواسـراو ☰ آویزان

**دۆڵ[۱] / doł/**: نـاو. دۆل: ۱. شـیو؛ دەرە؛ گـەلی؛ گەڵی؛ قوولایی نێـوان دوو کێـو ۲. پارچـە زەوی تەخت ۳. دەوڵە؛ تەشتی چکۆڵەی پلاستیکی ٤. کیسەی چەرمین بۆ تراو ٥. دەفری گەنم کوتـان بۆ ساوار ٦. دەهۆڵ؛ دەوڵ؛ سازی هەواڵـی سـڕنا ۷. تل؛ خلۆر؛ گلار ۸. گاسـنی سـەرچەماو ☰ ۱. درّە ۲. قطعە زمـین همـوار ۳. تشـتک پلاسـتیکی ۴. کیسەی چرمی ظرف مایع ۵. ظرف دانەکوبی ۶. دُهُل ۷. غلت ۸. گاوآهن خمیدە

⊡ **دۆڵ بوونەوە**: خلۆر بوونـەوە؛ گـلارەوە بـوون ☰ غلتیدن

**دۆڵ[۲]**: ئاوەڵناو. ڕۆچوو ☰ فرورفتە

⊡ **دۆڵ بون**: ڕۆچوون ☰ فرورفتن

**دۆڵ[۳]**: دەنگ. وشەی دنە دانی منالی ساوا بـۆ میـز کردن ☰ حرف تحریک بچە برای شاشیدن

**دۆڵ‌ئەنگێو / doł'engêw/**: ☚ **دەهۆڵ‌ژەن**

**دۆڵاب / dołab/**: نـاو. ۱. ☚ **دەولاب** ۲. جێگـەی جلک و جێوان لە دیواردا ‹پۆشتە لە جل دۆڵاب پڕ کا/ بەشی لات هەر دەرپێی شڕ کا «گۆران»› ۳. فێڵ و مەکر ‹ئەنگۆ بەقا مەکەن بە وان پـر و پیرێژنـێ دە زەمانەی، چەندی لە من بە دۆڵاب و بە فڕ و فێڵن ... «بەیتی پایزە»› ☰ ۱. ☚ **دەولاب** ۲. کمد ۳. نیرنگ

**دۆڵابە / dołabe/**: ناو. ١. جێگەی جلک و جێوان لە دیواردا ٢. کونی جێگەی دۆلاش ☰ ١. کُمُد ٢. جای ناو آسیا

**دۆڵاخ / dołax/**: ناو. ١. بەلەکپێچ ٢. فۆتەی ڕەشی سەرپۆشی ژنان ☰ ١. ساق‌پیچ ٢. چاقچور

**دۆڵاش / dołaş/**: ناو. دۆڵیان؛ کونێ لە ئاشدا کە لێوە گەنم، جۆ یان دەخلی تر دەڕژێتە سەر بەردەئاشەوە ☰ ناو آسیاب

**دۆڵاغ / dołağ/**: ناو. بەلەکپێچ؛ پووزەوانە؛ ساق‌پێچ ☰ ساق‌پیچ

**دۆڵاو / doław/**: ناو. دۆلاڤ؛ دۆڵیان: ١. لوولەی ئاوی ئاش کە دەڕژێتە سەر پەڕەی ئاش ٢. چاڵی پڕ لە ئاوی بارانی سەر تاشەبەرد ٣. قوڵفەی کانزای داخستنی سوخمە ٤. ئاوخۆرەی لە دار یا تەنەکە بۆ ئاو خواردنەوەی مالات ☰ ١. لولەی ریختن آب آسیاب ٢. چالەی پر آب روی سنگ ٣. بست یَلَک ۴. آخور آب

**دۆڵاوچە / doławçe/**: ناو. کابینێت ☰ کابینت

**دۆڵبە / dołbe/**: ناو. پالاخ؛ پەڵخە؛ گوێلکی گامێش ☰ بچەگاومیش

**دۆڵپا / dołpa/**: ناو. *[باوەڕی کۆن]* ١. بوونەوەرێکی خەیاڵی کە دەڵێن دوو پای درێژی وەک سێرمەی هەیە و ئەگەر لە دۆڵ و دەشتدا کەسێک بە تەنیایی ببینێتەوە، پا دەخاتە دەوری ملی و سواری دەبێ و بە زۆر دەیگەڕێنێ ٢. *[کینایە]* چەل‌ومل؛ بەلای دەس‌هەڵنەگر ☰ ١. دیو افسانەای ٢. بلای بختک

**دۆڵچە / dołçe/**: ناو. دەولک؛ سەتڵی چەرمین ☰ دولچە

**دۆڵدر / dołdir/**: ناوەڵناو. پڕ؛ لێواولێو ☰ لبریز

**دۆڵدرمە / dołdirme/**: ☜ **دۆندرمە**

**دۆڵدۆز / dołdoz/**: ناو. کەسێ کیسەی دۆ دەدروێ ☰ دوزندەی کیسەی دوغ

**دۆڵمە / dołme/**: ناو. سارمە؛ دۆڵمێ؛ قونتک؛ یاپراغ؛ یاپراخ؛ یاپراخی؛ ئەپرەخ؛ پراخ؛ ئاپراخ؛ چەن جۆر خۆراک کە پەسایان لە برنج و سەوزی و گۆشتە و لە نێو گەڵامێو، کەلەم، باینجان، تەماتە، بیبار یان کوولەکەی دەکەن و دەیکوڵێنن ☰ دُلمە

◘ **دۆڵمەی چەور لە زار نان**: *[پلار]* دۆڵمە تێ‌نان؛ زیاتر قسەی قۆڕ نەکردن ☰ یاوە نگفتن؛ چفت دهن را داشتن

**دۆڵمە تێ‌نان**: ☜ **دۆڵمەی چەور لە زار نان**

**دۆڵمێ / dołmê/**: ☜ **دۆڵمە**

**دۆڵە / dołe/**: ☜ **تەشت**

**دۆڵەدرێژە / dołed(i)rêje/**: ناو. بالابەرزە؛ زەڕنەقووتە؛ ئەژنۆڕووتە؛ بەرزەملێ؛ تلیا ناوین؛ قامکی ناوەڕاست؛ سێهەم قامک لە پەنجەدا ☰ انگشت وسطی

**دۆڵەدۆڵ / dołedoł/**: ناوەڵکار. لەرزەلەرز؛ لەرەلەر؛ بە لەرزینەوە ☰ لرزان

**دۆڵەدۆڵە / dołedołe/**: دەنگەناو. وشەی ڕاداشتنی منداڵ ☰ واژەی گرفتن بچە برای دفع

**دۆڵەکە / dołeke/**: ناو. سوێنە؛ دەفری سواڵەت، جێ نان ☰ ظرف سُفالین جای نان

**دۆڵەماج / dołemac/**: ناو. دۆغرمە ☰ آبدوغ‌خیار

**دۆڵەمکارە / dołem(i)kare/**: ناو. ئەسکەنەی ناو چاڵ ☰ اسکنەی قاشقی

**دۆڵەمە / doleme/**: ☜ **دەڵمە**

**دۆڵەمێ / dołemê/**: ☜ **دەڵمە**

**دۆڵیان / dołyan/**: ناو. ١. ☜ **دۆڵاش** ٢. ☜ **دۆڵاو**

**دۆڵیانە / dołyane/**: ناو. پانیژەی ئاش؛ جێ دەخلی هێشتا نەهاڕدراو ☰ جای غلەی هنوز آرد نشده در آسیا

**دۆم[1] / dom/**: ناو. ١. ڕەوەند؛ کۆچەر ‹دۆم بێ و

کلاش بۆ خۆی بکا «مەسەل»› ٢. دەهۆڵژەن ⊟ ١. کوچنشین ٢. دُهل‌زن

**دۆم**[٢]: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* فێڵباز؛ ساختەچی؛ دەسبڕ؛ جامباز ⊟ شیّاد

**دۆم**[٣]: ئاوەڵکار. هەمیشە؛ دایمەودەرهەم ⊟ همیشه

**دۆماندن / domandin/**: چاوگ. درێژە پێ دان ⊟ ادامه دادن

**دۆمانە / domane/**: ناو. قەترە؛ قۆرتە؛ لۆقە؛ گورگەلۆقە ⊟ یورتمه

**دۆمبەران / domberan/**: ☜ **دمبەلان ـ١**

**دۆمنە / domne/**: ☜ **دۆمینە**

**دۆمە / dome/**: ناو. پشتێندەی ڕەشماڵ لە بەر بای بەهێز ⊟ کمربند سیاه‌چادر

**دۆمەی / domey/**: ناو. ١. نێوان ٢. مەودا ⊟ ١. میانه ٢. فاصله

**دۆمی / domî/**: ناو. کاولی؛ قەرەچی؛ قەرەچ ⊟ کولی

**دۆمینە / domîne/**: ناو. دۆمنە؛ چەشنێ کایەی سەر مێز کە بە مۆرە دەکرێ ⊟ دومینو

**دۆمێ / domê/**: ناو. دۆستی بە ڕاستی؛ هەواڵی بەئەمەگ ⊟ دوست باوفا

**دۆن**[١] **/ don/**: ناو. ١. چەورایی ناو زگی ئاژەڵ ٢. بەزی تاویاوە؛ ٣. دەورە؛ دۆر؛ دۆرمادار ⊟ ١. چربی ٢. پیه گداخته ٣. پیرامون

⊡ **دۆن دان**: ١. چەور کردن؛ چەوری تێهەڵسوون ٢. *[کنایه]* سمێڵ چەور کردن؛ بەرتیل دان ⊟ ١. چرب کردن ٢. رشوه دادن

**دۆن**[٢]: ئامراز. نێزیکی؛ نزیکی ⊟ نزدیک؛ نزدِ

**دۆنادۆن / donadon/**: ناو. بڕوای ئاڵوگۆڕ بوونی گیان لە پاش مردن ⊟ مذهب تناسخ

**دۆنای / donay/**: ☜ **دواندن**

**دۆندرمە / dondirme/**: ناو. دۆلدرمە؛ بەستەنی؛ بەسەنی؛ چلوورە؛ شیر و شەکری بەستوو ⊟ بستنی

**دۆنقە / donqe/**: ناو. قاپ و جگی ڕەشەولاخ ⊟ شتالنگ گاو

**دۆنگی**[١] **/ dongî/**: ناو. ١. ئەنجام؛ ئاکام؛ ئاخر ٢. هەست ٣. گومان ٤. ئاکام ⊟ ١. آخر؛ انجام ٢. حس ٣. گمان ۴. نتیجه

**دۆنگی**[٢]: ئاوەڵناو. ١. خاوەن دووگ ٢. دوایی ⊟ ١. دارای دُنبه ٢. آخری

**دۆنم / donim/**: ناو. پێوانەیەکی زەمینە، لە تورکیا ١٠٠٠ و لە عیراق ٢٥٠٠ میتری چوارگۆشەیە ⊟ از واحدهای متراژ زمین، در ترکیه ١٠٠٠ و در عراق ٢٥٠٠ مترمربع

**دۆوات / dowat/**: ناو. داوەت؛ شایی؛ زەماوند ⊟ جشن عروسی

**دۆوانە / dowane/**: ☜ **دۆدانە**

**دۆوشکە / dowişke/**: ناو. شیرێژ؛ سیراج ⊟ کتخ

**دۆوک / dowik/**: ☜ **دۆک**

**دۆوەک / dowek/**: ☜ **دۆک**

**دۆه / doh/**: ☜ **دویکە**

**دۆی / doy/**: ☜ **دووکەڵ**

**دۆین / doy(i)n/**: ☜ **دۆینە**

**دۆینە / doyne/**: ناو. دوین؛ دوینە؛ دۆین: ١. گەنمی وشکەوەکراو و هاڕدراوی لە دۆدا کولاو بۆ خواردن ٢. چێشتی گەنم و دۆکەشک ⊟ ١. گندم کوبیده و با دوغ پخته ٢. آش گندم و کشک

**دۆینەدۆینە / doynedoyne/**: ناو. بەزمێ کە لوتی دەگەڵ ورچ و مەیموون و ... دەیگێڕێ ⊟ آهنگی که معرکه‌گیرها با آن حیوانات را می‌رقصانند

**دوو**[١] **/ dû/**: ناو. ١. یەکویەک ٢. کادوو؛ دووکەڵ ٣. دۆ؛ ماستاوی لە مەشکەدا ژەنراوی کەرە لێ گیراو ٤. دووگ؛ کۆمە بەزی ژێر پاشەلی مەڕ ‹دوو مەسپێرە دەس پشیلە «مەسەل»› ٥. کلک؛ دم؛ جووچکە ٦. دوا؛ پشتی سەر ‹کەوتمە دووی›

پاشان ‹وا مەزانە دەرئەنجام لەو جەنجاڵە تاڵ و تاریکە، بەتەواوی نەجاتم بووا› ≡ سرانجام

**دەراب / derab/**: ناو. تەقەڵی درشت ≡ بخیەی درشت

⊡ **دەراب دان**: دانووشتان و دروون بە تەقەڵی درشت ≡ دوختن با بخیەی درشت

**دەرازوون / derazûn/**: ☜ **دەرازین**

**دەرازوونە / derazûne/**: ☜ **دەرازین**

**دەرازین / derazîn/**: ناو. دەرازوون؛ دەرازوونە؛ دەرازینک ≡ آستانەی در

**دەرازینک / derazînik/**: ☜ **دەرازین**

**دەراشۆ / deraşo/**: ئاوەڵناو. [پلار] بێحەیای زماندرێژ (ژن) ≡ سلیطە

**دەراغ / derağ/**: ناو. ١. جێگەی چنینی فیشەکی دەمانچە و تفەنگ ٢. جێی فیلم کە لەگەڵ فیلمەکەدا دەخرێتە ناو کامێرا ≡ ١و٢. خشاب

**دەراڤ / derav/**: ☜ **دەراو**

**دەراڤیتن / deravîtin/**: ☜ **دەراویتن**

**دەرامەت / deramet/**: ☜ **داهات**

**دەرامەد / deramed/**: ☜ **داهات**

**دەراندن / derandin/**: چاوگ. ١. پەرژ و بڵاو کردن ٢. *[کینایە]* بە فیرۆ دان (ماڵ) ٣. درکاندن؛ دەرخستن ≡ ١. پخش‌وپلا کردن ٢. هدر دادن (دارایی) ٣. افشا کردن

**دەراندەر / derander/**: ئاوەڵکار. ١. سەرانسەر؛ تێکڕا؛ پاک ٢. هەمیشە؛ دایم ≡ ١. تمام و کمال ٢. مُدام

**دەراندێز / derandêz/**: ناو. جەژنی فەلەکانی ڕۆژهەڵات کە دەکەوێتە بیست و پێنجی مانگی بەفرانبار، ئاگرێکی زۆر زل دەکەنەوە ≡ از اعیاد مسیحیان مشرق در بیست و پنج بهمن کە در آن آتش بزرگی برپا می‌کنند

**دەرانە / derane/**: ☜ **درگا**

**دەرانین / deranîn/**: ☜ **دەرهێنان**

**دەراو / deraw/**: ناو. دەراڤ: ١. بوار؛ جێگەی پەڕینەوە لە ئاو ‹هەوالانی‌تریش پەڕینەوە و ئێستر بەجێ مان؛ کە بە دەراوێکی دیکەدا بۆمان بنێرن «هەژار، *چێشتی مجێور*»› ٢. جێگەی ئاو خواردنەوەی پەز ٣. شێواز و شێوەی دەربڕینی قسە ‹دەراوی دەمی ناخۆش بێ، دەمپیس بێ، جنێوفرۆش بێ «هەژار، *چوارنامیلکە*»› ≡ ١. گُدار ٢. آبشخور گوسفندان ٣. لحن

**دەراوسا / derawsa/**: ☜ **دراوسێ**

**دەراویتن / derawîtin/**: چاوگ. تێپەڕ. تێنەپەڕ. دەراڤیتن: □ تێپەڕ. ١. لێ‌کەم کردنەوە □ تێنەپەڕ. ٢. هەڵتەکانی چێندراو لە بەر سەرما ≡ ١. کم کردن ٢. از بین رفتن کشت بر اثر یخبندان

**دەراویشتن / derawîştin/**: ☜ **دەرهاویشتن**

**دەراهە / derahe/**: ئامراز. لەوێ؛ هێما بۆ دوور ≡ در آنجا

**دەرب / derb/**: ناو. ١. زەبر؛ زەربەت ٢. نۆرە؛ نۆبە ٣. جار؛ هەل؛ چەل ٤. هێز و تاقەت ٥. ڕێ؛ ڕێگا؛ ڕێگە ≡ ١. ضربت ٢. نوبت؛ داو ٣. بار؛ دفعە ٤. تاب و توان ٥. راه

**دەربات / derbat/**: ئاوەڵناو. هاوهێز؛ دەبار ≡ هم‌نیرو

**دەربار**[1] **/ derbar/**: ناو. دیوەخانی پاتشا ≡ دربار

**دەربار**[2]: ☜ **دەربارەی**

**دەربارەی / derbarey/**: ئامراز. دەربار؛ لە بابەت؛ لەمەڕ ≡ دربارەی

**دەرباز**[1] **/ derbaz/**: ناو. دەرباس: ١. کار و ڕەوتی تێپەڕین ٢. دەرەتان؛ شوێنی دەرباز بوون ‹هەر چۆنێک بێ دەربازێک دەدۆزمەوە› ≡ ١. گذر ٢. مفر

⊡ **دەرباز بوون**: تێپەڕاندن؛ لە شوێنێکەوە تێپەڕین ≡ گذر کردن

**دەرباز**[2]: ئاوەڵناو. دەرباس؛ ڕزگار؛ قوتار ≡ رستگار؛ رها

▣ **دەرباز بوون:** ڕزگار بوون؛ خەلسان؛ لە تەنگانەیەکەوە تێپەڕین ‹لەو شەڕە دەرباز بووم› 📖 نجات یافتن

**دەرباز کردن:** ڕزگار کردن؛ خەلساندن ‹ئەگەر مەردە، بە جەرگە، پاکە، سەرباز/ دەبا بێ و من بکا لەو بەندە دەرباز! «هێمن»› 📖 نجات دادن

**دەربازگە / derbazge/:** ناو. دەرەتان؛ ڕێگەی ڕزگاری 📖 راه رستگاری

**دەربازی / derbazî/:** ناو. ١. ڕزگاری؛ نەجات ‹دەربازی خەڵک لە پێکەوەبووندایە› ٢. *[کنایە]* ئازادی ‹وا بە زیندان ڕاهاتووە، حەز بەم دەربازییە ناکا!› 📖 ١. رستگاری ٢. آزادی

**دەرباس / derbas/:** ☜ **دەرباز**

**دەربان / derban/:** ناو. دەرکەوان؛ دەرگاوان 📖 دربان

**دەربایس / derbayis/:** ☜ **دەربایست**

**دەربایست / derbayist/:** ئاوەڵناو. دەربایس؛ دەربەست؛ دەروەن؛ دەربەند؛ پابەند؛ پێبەند؛ دەرقەد؛ گوێدەر بە کار 📖 پایبند

▣ **دەربایست بون:** پابەند بوون؛ دەربایست هاتن؛ گرنگی پێ دان ‹ئەگەر دەربایستی ئەم قسانە بی کارت پێ ناکرێ› 📖 پایبند بودن

**دەربایست هاتن:** ☜ **دەربایست بون**

**دەربایستی / derbayistî/:** ناو. دەربایسی؛ دەربەستەیی 📖 پایبندی

**دەربایسی / derbay(i)sî/:** ☜ **دەربایستی**

**دەربداری / derb(i)darî/:** ناو. هێز و توانا؛ تاقەت 📖 توان

**دەربردن / derbirdin/:** چاوگ. دەربرن: ١. ڕزگار کردن؛ خەلساندن؛ دەرباز کردن ‹گیانی بە سەلامەت دەربرد› ٢. هەڵکردن؛ خۆ گرتن؛ تاقەت هێنان ‹لە ژێر ئەشکەنجەدا دەری‌نەبرد و گیانی دا› 📖 ١. نجات یافتن ٢. مقاومت کردن

**دەربرن / derb(i)rin/:** ☜ **دەربردن**

**دەربڕین / derb(i)řîn/:** چاوگ. دەرقە دان؛ نیشان‌دان؛ ئاشکرا کردن؛ دەرخستن ‹نارەزایەتی دەربڕین؛ قسە دەربڕین› 📖 اظهار کردن

**دەربک / derbik/:** ناو. دەفری دارین بۆ بارووت 📖 ظرف چوبی باروت

**دەربواردن / derb(i)wardin/:** چاوگ. هەڵاواردن؛ لە ناو دەرخستن 📖 حذف کردن

**دەربون / derbûn/:** چاوگ. دەم کردنەوە (کوان و ...) 📖 دهان باز کردن (دُمل و ...)

**دەربونە / derbûne/:** ناو. کۆڵانی تەنگ؛ کووچەی بەرتەسک 📖 کوچەی تنگ

**دەربەدەر / derbeder/:** ئاوەڵناو. دەروەدەر؛ بێ‌ماڵ و حاڵ؛ ئاوارە؛ ڕەبەن ‹نالی کە سەدری مەسنەدی تەمکینی تەکیە بوو/ بۆ تۆ بووە بە دەربەدەری کووچە و سوقاق «نالی»› 📖 آوارە

**دەربەدەری / derbederî/:** ناو. دەروەدەری؛ ڕەبەنی؛ ئاوارەیی؛ بێ‌ماڵ‌وحاڵی 📖 آوارگی

**دەربەس / derbes/:** ☜ **دەربەست**

▣ **دەربەس بون:** دەروەن بوون ‹هێندە سەرگەرمە کوڕت کاتێ کە سەر دێنێتە دەر/ پێ لە خوێنی خۆی ئەنێ، دەربەس نییە بۆ ڕۆح و سەر «قانع»› 📖 اعتنا نکردن

**دەربەست[1] / derbest/:** ئاوەڵناو. دەربەس؛ دەربەستە؛ دەربەسە: ١. تەرخان بۆ کەڵک وەرگرتنی تاقە کەس، دەستە یان ڕێکخراوەیەک ‹ئەم ماڵە دەربەستە› ٢. دەربایست ‹بە فیدایان دەکەم سەر ئیبنویەمین/ چونکە دەربەستی غیرەتی کوردین «حاجی قادر»›. هەروەها: **دەربەست بوون** 📖 ١. دربست ٢. پایبند

**دەربەست[2]:** ئاوەڵکار. دەربەس؛ دەربەستە؛ دەربەسە؛ لەگەڵ هەموو کەل‌وپەلدا ‹دەربەست ئیجارەم گرتووە› 📖 دربست

**دەربەستە** / derbeste/: ☜ **دەربەست**

**دەربەستەیی** / derbesteyî/: ☜ **دەربایستی**

**دەربەسە** / derbese/: ☜ **دەربەست**

**دەربەشە** / derbeşe/: ناو. تاوە؛ دەفری پەل بۆ تێدا سوورکردنەوە ☲ تابه

**دەربەن**[1] / derben/: ناو. دەربەند: ١. دەرە؛ گـەلی؛ گەلی ٢. ڕێگەی دەم گەلی ٣. دەسکی دەفـر ☲ ١. درّەی تنگ ٢. تنگە؛ دهانەی درّە ٣. دستەی ظرف

**دەربەن**[2]: ئاوەڵـناو. دەربەنـد؛ پابەنـد؛ دەربـایس ☲ پایبند

**دەربەنجەڵە** / derbenceļe/: ☜ **دەرمەنجێڵە**

**دەربەند** / derbend/: ☜ **دەربەن**

**دەربیجە** / derbîce/: ناو. دەریژە؛ ڕۆچنە لە دەرگـا و پەنجەرەدا ☲ دریچه

**دەربێن** / derbên/: ناو. دەربێنک؛ زاربێنی مەشـکە و دەفری‌تر ☲ دهانەبند ظرف و خیگ و ...

**دەربێنک** / derbênik/: ☜ **دەربێن**

**دەرپ** / derp/: ناو. تەور؛ تەوەر ☲ تبر

**دەرپاچە** / derpaçe/: ناو. دەرلینگ؛ لای ژێـرووی پاتۆل و دەرپێ ☲ پاچەی شلوار

**دەرپۆش** / derpoş/: ناو. سەربێن ☲ درپوش

**دەرپۆشک** / derpoş(i)k/: ناو. دەرپۆش؛ دەرخۆنـە؛ سەرپۆشی دەفر ☲ سرپوش ظرف

**دەرپۆقین** / derpoqîn/: چاوگ. هەڵـتۆقینی چـاو؛ گلێنە بەرەو دەرەوە دیاردان ☲ برآمدن چشم

**دەرپۆقیـو** / derpoqîw/: ئاوەڵناو. هەڵتۆقیو؛ بۆق ☲ از حدقه درآمده

**دەرپەڕان** / derpeřan/: ☜ **دەرپەڕین**

**دەرپەڕاندن** / derpeřandin/: چاوگ. دەرچڕانـدن؛ دەرچڕانن: ١. دەرکردن لە جێگە بە ترسـاندن و زۆر بۆ هێنـان ‹پێشـمەرگە داعشـی لـە کـەرکووک دەرپەڕانـد› ٢. قـووچ کردنـەوەی ئەنـدام ‹دونژوانێک نیم سنگ دەرپـەڕێنم/ لـە سـینەماکان تێر بتگەڕێنم «پەشێو»› ☲ ١. بیرون رانـدن ٢. بـارز نشان دادن عضو

**دەرپەڕاو** / derpeřaw/: ☜ **دەرپەڕیو**

**دەرپـەڕیـن** / derpeřîn/: چـاوگ. دەرپـەڕان؛ دەرچـڕان: ١. لەپـڕ دەرچـوون بـۆ دەرەوە ‹کەروێشکێک لە بن دەوەنەکەوە دەرپەڕی› ٢. زەق بـوون؛ زۆپ دیـاردان ‹چـاوی دەرپـەڕیوە› ☲ ١. بیرون پریدن ٢. برجستە بودن اندام

**دەرپـەڕیـو** / derpeřîw/: ئاوەڵـناو. دەرپـەڕاو؛ زۆپ؛ قۆقز ☲ برجستە

**دەرپی** / derpî/: ☜ **دەرپێ**

**دەرپێ** / derpê/: ناو. دەرپی؛ شواڵ ☲ تُنبان

**دەرتـەقێن** / derteqên/: نـاو. ئاڵـقەی دریانـە ☲ درکوب

**دەرج** / derc/: ↓

⊡ **دەرج هـاتن**: چارە هاتن ‹ئەوانە هەموو دەرجیـان دێ، دەردی گەورە بێ‌عەداڵەتییە› ☲ چارە شدن

**دەرجا** / derca/: ناو. پاکوتـە؛ پـاکوتکی؛ لـەجێ ☲ درجا

**دەرجاو** / dercaw/: ناو. دەرجەو: ١. خاولی حەمام ٢. هەر چندراوێکی پرزەدار ☲ ١. حولەی حمام ٢. بافتەی پُرزدار

**دەرجەو** / dercew/: ☜ **دەرجاو**

**دەرچاڤ** / derçav/: ☜ **دەرچاو**

**دەرچـاو** / derçaw/: نـاو. دەرچـاڤ؛ دەسەسـڕ؛ دەسماڵ؛ دەسرەی دەم و چاو ☲ دستمال صورت

**دەرچڕان** / derç(i)řan/: ☜ **دەرپەڕین**

**دەرچڕاندن** / derç(i)řandin/: ☜ **دەرپەڕاندن**

**دەرچڕانن** / derç(i)řanin/: ☜ **دەرپەڕاندن**

**دەرچک** / derçik/: نـاو. ڕێسمە؛ ژێردەرانە؛ پاژنـەی درگا ☲ پاشنەی در

**دەرچوو** / derçû/: ☜ **دەرچووگ**

**دەرچـووگ** / derçûg/: ئاوەڵـناو. دەرچـوو؛ بـازدایی؛

هەڵاتوو ≡ فراری

**دەرچوون / derçûn/**: چاوگ. ١. ڕا کردن؛ هەڵاتن ‹تا ماڵەوە دەرچووم› ٢. دەرپەڕین؛ دەرزەنین؛ ڕاپسکان؛ بە شێوەی نەخوازراو بەر بوون ‹دەرچوونی تیر؛ لە دەست دەرچوون› ٣. ڕاکردن بە مەبەستی خۆ دەرکردن ‹دەرچۆ نەتگرن!› ٤. ترازیان؛ لە جێ چوون؛ لە جێی خۆ دەرهاتن ‹شانم دەرچووە› ٥. خەرج بوون؛ تێچوون ‹سێ ملیۆن خەرجمان دەرچوو› ٦. قەبووڵ بوون؛ وەرگیران ‹بە نمرەی باش دەرچووم› ≡ ١. دویدن ٢. دررفتن ٣. فرار کردن ۴. از جا دررفتن ۵. خرج شدن ۶. قبول شدن

**دەرچین / derçîn/**: ناو. دەرچینک؛ قەرتاڵە؛ تریان ≡ سبد میوەچینی

**دەرچینک / derçînik/**: ☜ دەرچین

**دەرحەسین / derĥesîn/**: چاوگ. خلیسکان؛ خزیان ≡ لغزیدن

**دەرحەق / derĥeq/**: ئامراز. لە حەق؛ سەبارەت بە ڕەچاو کردنی ماف و حەق ‹تۆ کەمنەزەری دەرحەقی من ئێستەکە ئاغا!/ من ماومە هەوای سوحبەتی تۆم هەر لە دەماغا «شێخ ڕەزا»› ≡ درحق؛ نسبت به

**دەرخ / derx/**: ناو. ١. دەرخک؛ نەمام؛ شەتڵ ٢. ئەزبەر؛ لە بەر ‹شیعرەکەم دەرخ کردووە› ≡ ١. نهال ٢. از بر؛ حفظ

⊡ **دەرخ کردن:** لە بەر کردن ≡ حفظ کردن؛ از بر کردن

**دەرخستن / derxistin/**: چاوگ. ئاشکرا کردن؛ نیشان دان؛ نواندن ‹تەبەسسوم دەردەخا حوققەی دەم و جەوهەر لە نێو ئەودا/ بەڵێ مسقاڵەزەڕڕە زاهیرە جیلوەی لە پەرتەودا «نالی»› ≡ بروز دادن

**دەرخک / derxik/**: ☜ دەرخ ـ١

**دەرخوارد[1] / derx(i)ward/**: ناو. کاری پێ خوراندن ≡ کار خورانیدن

⊡ **دەرخوارد دان:** دانە دەرخوارد ≡ به خورد دادن

**دەرخوارد[2]**: ئاوەڵناو. شیاو؛ شایان؛ ژێهاتی؛ هێژا ≡ شایسته

**دەرخواست / derx(i)wast/**: ناو. داخواز؛ داواکاری ≡ درخواست

**دەرخورد / derxurd/**: ئاوەڵناو. شیاو؛ لایق؛ هێژا ≡ شایسته

**دەرخون / derxun/**: ☜ دەرخۆنە ـ١

**دەرخۆر / derxor/**: ئاوەڵناو. شیاو؛ درووس؛ ڕەوا ≡ جایز؛ درخور

**دەرخۆنە / derxone/**: ناو. ١. دەرخون؛ دەرخووین؛ دەرخووینک؛ سەرپۆشی دەفر ‹دیزە بە دەرخۆنە باشترە «مەسەل»› ٢. سندان؛ نەخۆشییەکی یەکسمە ≡ ١. درِ ظرف ٢. نوعی بیماری ستور

**دەرخووین / derxuwîn/**: ☜ دەرخۆنە ـ١

**دەرخووینک / derxuwînik/**: ☜ دەرخۆنە ـ١

**دەرد / derd/**: ناو. ١. ژان؛ ئێش؛ ئازار ‹وە سووز سینە و ئاهـ سەرد قەسەم/ وە شام تیرە و ڕەنج و دەرد قەسەم «شامی»› ٢. نەخۆشی؛ ناساغی ‹دەرد من فرەس بێژم بۆ هەر کەس/ وەک مارانگەستە هەر شوێنەکەی هەس «فولکلۆر»› ٣. *[مەجاز]* خەفەت؛ کەسەر ‹لە دڵما خەم و داخی ئەم دەردە سەوزە/ کە دەردی گرانی هەموو ڕێبوارێ وەنەوزە «سوارە»› ٤. *[مەجاز]* کێشە؛ گیر و گرفت ‹نووری ڕوخسارت وەدەرخە، دەردی بێدەرمانە شەو/ زوڵمەتی زوڵفت لە سەر ڕووتە، لە ڕۆژ میوانە شەو «ئاوات»› ٥. *[مەجاز]* جۆر؛ لەون؛ شێواز ‹بە هەچ دەردێک بوو نان و چا خورا/ دیسان بۆ ڕێگا ناوی خوا برا «گۆران»› ≡ ١. درد؛ آزار ٢. بیماری ٣. غم؛ اندوه ۴. مُشکل ۵. شکل؛ نوع

⊡ **دەردی بێدەرمان:** دەردێ کە چاری نایە ‹موفتی گەر ئەقڵت هەبێ هەوڵی ژیانت چاترە/ سەد

ئەوەندەی تر بڵەی هەر دەردی بێدەرمانە کورد «موفتی پێنجوێنی»› ☰ درد بی درمان

**دەردی دڵ:** باسی خەفەت و ناڕاحەتی دەروون ☰ دردِ دل

**دەردی کاری:** دەردی گران؛ نەخۆشی بڤە؛ دەردێ کە چاری دژوارە ☰ بیماری صعبُ‌العلاج

**دەردی گران:** ☜ **دەردی کاری**

⊡ **دەردێک دەوا/ دەرمان کردن:** *[کنایە]* بە کاری شتێک هاتن ‹ئەم قسانە دەردێک دەوا ناکا› ☰ دردی را دوا کردن

(**بە**) **دەرد خواردن:** بە کار هاتن؛ بە کەڵک هاتن ‹نە دەرد جوفت خوەن نە دەرد باری/ سەرمەستن وەجام بادەی بیعاری «شامی»› ☰ به درد خوردن

**دەردئاشنا / derd'aş(i)na/:** ئاوەڵناو. دەردەزان؛ ئاگا لە خەم و دەردی خەڵک ☰ دردآشنا

**دەردان / derdan/:** چاوگ. ١. دەلاندن؛ تەڕایی دانە دەر ‹ئارەقەم دەرداوە› ٢. خاوێن کردنەوە لە شتی شل ‹جۆگەکە دەردە!› ٣. دانە دەر؛ بۆ دەرەوە فڕێ دان؛ دەرخستن ‹سەروچاوی زیپکەی دەرداوە!› ٤. دەرهێنان ‹جوانەزمە دەردان› ☰ ١. تراوش کردن ٢. روفتن ٣. بیرون زدن ۴. درآوردن

**دەردانک / derdanik/:** ناو. کیسەی ماست و پەنیری تازە بۆ ئاو لێ چۆڕان ☰ کیسەی ماست و پنیر تازە کە آب تراوش کند

**دەرداوی / derdawî/:** ئاوەڵناو. نەخۆش؛ لەش‌بەبار ☰ بیمار

**دەردبار / derdbar/:** ئاوەڵناو. ١. نەخۆش؛ لەش‌بەبار ٢. خەمبار؛ خەفەتبار ☰ ١. بیمار ٢. غمگین

**دەردخواردگ / derdx(i)wardig/:** ☜ **دەردخواردو**

**دەردخواردو / derdx(i)wardû/:** ئاوەڵناو. دەردخۆر؛ دەردخواردگ؛ بە هورم و بایەخ ☰ بەدردبخور

**دەردخۆر / derdxor/:** ☜ **دەردخواردو**

**دەردکێش / derdkêş/:** ئاوەڵناو. ١. دەردمەند؛ بە ئازار ٢. خەفەتبار؛ خەمبار ☰ ١. دردمند ٢. غمگین

**دەردگرو / derdg(i)rû/:** ناو. نەخۆشی گران ☰ بیماری صعبُ‌العلاج

**دەردمردە / derdmirde/:** ئاوەڵناو. ١. لاوازی لە مردن ٢. مردوو لە بەر لاوازی و نەخۆشی ☰ ١. لاغرمُردنی ٢. مُردە بر اثر مریضی و نزاری

**دەردمەن / derdmen/:** ☜ **دەردەدار-٢**

**دەردمەند / derdmend/:** ☜ **دەردەدار-٢** .

**دەردۆ / derdo/:** دەنگ. داخەکەم؛ بە داخەوە ☰ دریغا

**دەردۆر / derdor/:** ناو. ١. هاڤر؛ دۆراندۆر؛ دەوروبەر ‹دەردۆرێن باژار هاتن گرتن› ٢. سروشت ☰ ١. پیرامون ٢. طبیعت

**دەردۆرێ / derdorê/:** ئامراز. نزیک؛ دەوروبەر ‹ئەز دەردۆرێ سەعات دەهێ هاتم› ☰ حدودِ؛ حوالیِ

**دەردۆک / derdok/:** ئاوەڵناو. دڕدۆنگ؛ دوودڵ؛ بە گومان ☰ مشکوک

**دەردو / derdû/:** ناو. زاربێن؛ دەمبێنی مەشکە ☰ دهانەبند مَشک

**دەردەباریکە / derdebarîke/:** ناو. سیل؛ دیق ☰ بیماری سل

**دەردەبۆرە / derdebore/:** ناو. نەخۆشییەکە ☰ از بیماری‌ها

**دەردەچەپەڵە / derdeçepeɫe/:** ناو. نەخۆشیی ڕشانەوە و زگچوونی منالان ☰ بیماری اسهال و استفراغ کودکان

**دەردەدار / derdedar/:** ئاوەڵناو. ١. نەخۆش؛ بەئازار؛ لەش‌بەبار ‹هەی داد و بێداد کەی وەها بیوە/ کەی حەکیم بۆ لای دەردەدار چیوە «فولکلۆر»› ٢. دەردمەن؛ دەردمەند؛ خەفەتبار ✱ هەروەها: **دەردەداری** ☰ ١. بیمار ٢. اندوهگین؛ دردمند

**دەردەدڵ / derdediɫ/:** ناو. دەردی دڵ؛ ڕەنجی

دەروون ≡ دردِ دل

▣ **دەردەدڵ کردن:** خەم و خەفەتی خۆ لای کەسێک درکاندن و سووک بوونەوە ≡ دردِ دل کردن

**دەردەزان** / derdezan/: ☜ **دەردناشنا**

**دەردەس** / derdes/: ☜ **دەسترەس**

**دەردەست** / derdest/: ناوەڵناو. ١. پەردەژ؛ بەدەستەوە؛ لە بەردەست ٢. *[کنایە]* یەخسیر؛ دیل ≡ ١. در دسترس ٢. اسیر

**دەردەسەری** / derdeserî/: ناو. زەحمەت؛ ئەرکی زۆر ≡ دردسر

**دەردەسی** / derdesî/: ناو. ژانەسی؛ پزوو؛ فرک؛ نەکسۆ؛ نەخۆشی پەنەمان و چلک کردنی سی، کە یاو، کۆخە و بەڵخی لەگەڵدایە ≡ ذات‌الریه

**دەردەکۆبان** / derdekoban/: ☜ **دەردەکۆپان**

**دەردەکۆپان** / derdekopan/: ناو. دەردەکۆبان؛ دەردەکۆپانە: ١. کوزاز؛ تێتانووس؛ نەخۆشییەکی باکتریاییە، ماسوولکەکانی لەش تووشی کرژ بوونێکی بەژان دەکا، ئەم نەخۆشییە لە زامەوە دەگوازرێتەوە ٢. نەخۆشییەکی منداڵانە ≡ ١. کُزاز ٢. از بیماری‌های کودکان

**دەردەکۆپانە** / derdekopane/: ☜ **دەردەکۆپان**

**دەردەمریشک** / derdem(i)rîşk/: ناو. نەخۆشی مامر ≡ بیماری ماکیان

**دەردهەر** / derdher/: ناوەڵناو. خەمخۆر؛ سەرپەرستی دڵسۆز ≡ غمخوار

**دەردی** / derdî/: ئامراز. وەک؛ گوێرەی ‹دەردی ئینگلیسی گوتەنی: «هێندە دەوڵەمەند نیم شتی هەرزانبایی بسێنم»› ≡ همچون

**دەردیدڵ** / derdîdil/: ناو. لەجە؛ گلەیی لە بەخت ≡ درددل

**دەردیسەر** / derdîser/: ناو. دەردیسەری؛ دەردی سەر: ١. ئەرک و ڕەنجی زۆر ٢. ئەرک؛ زەحمەت ≡ ١. مشقت ٢. زحمت

**دەردیسەری** / derdîserî/: ☜ **دەردیسەر**

**دەردین** / derdîn/: ناو. ١. نەخۆش؛ دەردەدار ٢. دڵ پڕ لە کوڵ ≡ ١. بیمار ٢. دردمند

**دەرز** / derz/: ناو. ١. درز؛ قەڵشی باریک ٢. وانە؛ دەرس ≡ ١. ترک ٢. درس

▣ **دەرز بردن:** قەڵشین بێ لێکبوونەوە ≡ ترک برداشتن

**دەرزبێژ** / derzbêj/: ☜ **دەرسبێژ**

**دەرزن** / derzin/: ناو. دوجین؛ دەستەیەک بریتی لە دوازدە دانە ≡ دوجین

**دەرزە** / derze/: ناو. باقە؛ باغە؛ باوەشە کڵۆش یان گیای بەستراو ≡ بافه؛ توده گیاه بسته

**دەرزەن** / derzen/: ناو. دووجین؛ یەکەی ژماردنی کەلوپەل، بریتی لە دوازدە دانە ≡ دوجین

**دەرزەنین** / derzenîn/: ☜ **دەرچوون ـ٢**

**دەرزی** / derzî/: ناو. ١. دەرژەن؛ ئامێری دروومان بە شێوەی میلەیەکی پۆلایی چکۆلە و باریک و نووک‌تیژ بە کونێکی ورد لە بنەوە بۆ تێخستنی بەن ٢. پارچە زەنبەرێکە لە سەر دەدرێ ٣. جل‌درووی؛ خەیات ٤. ئەمپوول؛ شرینقە؛ ئامرازی دەرمان دە لەش کردن ٥. درێشووکەی مار ≡ ١. سوزن ٢. زیوری است ٣. خیاط ٤. آمپول ٥. نیش مار

▣ **دەرزی پێوە کردن:** دەزوو بە دەرزییەوە کردن ≡ سوزن نخ کردن

**دەرزی لێ دان:** دەرزی وەشاندن/ وەشانن؛ ئەمپوول لێدان ≡ آمپول زدن

**دەرزی وەشاندن/ وەشانن:** ☜ **دەرزی لێدان**

**دەرزیئاژن** / derzî'ajin/: ناو. دەرزی‌کوت؛ کاری نووکەدەرزی دە زۆر جێگە ڕۆکردن ≡ سوزن‌کوبی

**دەرزیاپشت** / derz(i)yapişt/: ناو. مۆرەغە؛ مۆرووی پشت ≡ ستون فقرات

**دەرزیدان** / derzîdan/: ناو. قوتوولەی دەرزیان ≡

سوزندان

**دەرزیسنجاخ** / derzîsincax/: ناو. دەرزیلەی قایم کردنی قوماش و بەر یەخە ⚑ سنجاق قفلی

**دەرزیقژ** / derzîqij/: ناو. دەرزیلە؛ قردێلە ⚑ سرخاره

**دەرزیک** / derzîk/: ناو. مامزەی پاژنەی سواران ⚑ مهمیز

**دەرزیکوت** / derzîkut/: ناو. دەرزیئاژن؛ کاری بە نووکە دەرزی دە زۆر جێگە ڕۆکردن ⚑ سوزن‌کوبی

**دەرزیگیا** / derzîg(i)ya/: ناو. دڕەیلێ؛ گیای شەکەرمز ⚑ علف مرض قند

**دەرزیلۆکە** / derzîloke/: ناو. دەرزیلە؛ گیایەکە گەڵای لە دەرزی دەچێ ⚑ گیاهی برگ سوزنی

**دەرزیلە** / derzîle/: ناو. ١. ☜ **دەرزیلۆکە** ٢. دەرزیسنجاخ؛ دەرزی شت پێ قایم کردن کە دادەخرێ ٣. پارچە خشڵێکە بۆ سەر ٤. ماسی دەرزیلە ⚑ ١. ☜ **دەرزیلۆکە** ٢. سنجاق قفلی ٣. سرخاره (زیوری است) ۴. سوزن ماهی

**دەرزی و دەزوو** / derzî û dezû/: ناو. وردەواڵەی پێویست بۆ دروومان ‹ئەسپابی پێشمەرگەیی: قرۆشکەی چا، دەرزی و دەزوو و وردە بابەتم تێک نا «هەژار، چێشتی مجێور»› ⚑ نخ‌سوزن

**دەرزیوەشێن** / derzîweşên/: ناو. شرینقەوەشێن؛ ئەو کەسەی دەرزی لە نەخۆش دەدا ⚑ آمپول‌زن

**دەرژەن** / derjen/: ناو. ١. دەرزی درووman ٢. دەرتەقێن؛ ئاڵقەی درگا ⚑ ١. سوزن ٢. درکوبه

**دەرس** / ders/: ناو. ١. وانە؛ دەرز؛ درز ٢. *[مەجاز]* پەند؛ ئامۆژگاری ⚑ ١. درس ٢. پند

▣ **دەرس پێ دان**: ١. وانە فێر کردن ‹کێ دەرستان پێ دەدا؟› ٢. *[مەجاز]* پەند پێ دان ‹ئەم ڕووداوە، دەرسێکی باشی پێ دا› ⚑ ١. درس دادن ٢. پند دادن

**دەرس خوێندن**: ١. دەرس فێر بوون ٢. خوێندکار بوون ⚑ ١و٢. درس خواندن

**دەرس خوێندنەوە**: خوێندنەوەی نووسراوەیەکی دەرسی ‹با ئەم دەرسە پێکەوە بخوێنینەوە› ⚑ درس خواندن

**دەرس دانەوە**: وتنەوەی ئەو دەرسەی کە دەبێ فێری بێ ⚑ درس پس دادن

**دەرس لە بەر کردن**: خۆ ڕاهێنان و بە یاد سپاردنی دەرس ‹دەرسەکەم بە باشی لە بەر کردووە› ⚑ درس از حفظ کردن

**دەرس وتنەوە**: شتێ بە مەبەستی فێر کردن بە دیتران گوتن ‹مامۆستاکەمان لە دەرس وتنەوەدا زۆر زیرەکە› ⚑ درس دادن؛ تدریس کردن

**دەرس وەرگرتن**: ١. فێر بوون ‹دەرسەکانی باش وەرناگرێ› ٢. پەند وەرگرتن ‹لەم ڕووداوە دەرسێکی باشی وەرگرت› ⚑ ١. درس (یاد) گرفتن ٢. عبرت گرفتن

**دەرساخ** / dersax/: ناو. دەستاخ؛ دەستاق؛ دۆساخ؛ زیندان ⚑ زندان

**دەرسبێژ** / dersbêj/: ناو. دەرزبێژ؛ فێرکار؛ مامۆستای منداڵان ⚑ معلم آموزگار

**دەرسخانە** / dersxane/: ناو. فێرگە؛ قوتابخانە ⚑ مدرسه

**دەرسخوێن** / dersx(i)wên/: ناوەڵناو. هۆگری دەرس خوێندن و فێر بوون ⚑ درسخوان

**دەرسخوێندوو** / dersx(i)wêndû/: ناوەڵناو. خۆندی؛ خوێندەوار ⚑ تحصیل‌کرده

**دەرسروشتی** / ders(i)ruştî/: ناوەڵناو. سەمەرە؛ عەجیب؛ هەژەند؛ دوور لە بارودۆخ یان چۆنیەتیی سروشتی و ئاسایی ⚑ خارق‌العاده

**دەرسودەور** / ders û dewr/: ناو. کاری خوێندن و دەورکردنەوە و نووسین ‹وتت: ئەم جێیە جێی عەیشە، بە دەرسودەوری قەت نادەم/ سەفای ئاویدەر

و کانیشەفا و باغ و گولستانی «جەوهەری»› ▬ درس‌ومشق

**دەرسۆک** / dersok/: ناو. دەسرە؛ دەسەسڕ؛ دەسماڵ ▬ دستمال

**دەرشۆ** / derşo/: ناو. پەڕۆیەک دەیخەنە ژێر تەشتی جلشۆری، ڕایگرێ ▬ پارچەی زیر تشت رختشویی کە سُر نخورد

**دەرفرتان** / derfirtan/: چاوگ. دەرپەڕین ▬ بیرون جهیدن

**دەرفرتاندن** / derfirtandin/: چاوگ. ١. دەرپەڕاندن ٢. دەرهێنان ▬ ١. بە بیرون جهاندن ٢. بیرون آوردن

**دەرفەت** / derfet/: ناو. هەل؛ هەڤراز؛ هولل؛ بڕفەت؛ برفات؛ فرسەت؛ قانگ؛ کێس؛ کیس؛ کەیس؛ قیس؛ فەرسەند؛ هۆ؛ هەڕەت؛ هەرات؛ ئەختان؛ چەل؛ دەلف؛ دەرب؛ دەلیڤە؛ وچان؛ پەردێژ؛ پەردۆژ؛ پەردووژ؛ لیڤ؛ بیڤ؛ بوارە؛ مەزال؛ سۆنکە؛ سۆنگە؛ هەلکەوت؛ ورنەک؛ باو؛ ڕاو؛ ئەوڕاو؛ دەوام؛ پیلیسک؛ ماوەیێ کە بۆ کەس یان کارێک دەست دەدا و وێدەچێ دووپاتە نەبێتەوە ‹مەی تێکە! وەخۆ! دەرفەتە، هاکا مردی/ لەم ژێر گلە بێ‌هەوال و بێ‌هاودەردی «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ▬ فُرصت

▣ **دەرفەت (پێ) دان:** ماوە پێ دان ‹دەبێ دەرفەتی پێ بدەی تا تەواوی بکا› ▬ فُرصت دادن

**دەرفەت (بۆ) ڕەخسان:** بۆ ڕەخسان؛ دەرفەت دەست کەوتن ‹ئەگەر دەرفەتی کارت بۆ ڕەخسا، ڕامەوەستە!› ▬ فُرصت یافتن

**دەرفەت لە دەست دان:** بە سەر چوونی ماوەی بەکەڵکی شتێ ‹ڕابوێرە! دلت خۆش کە! چما خەم‌لەبەری؟/ دەرفەت لە دەست ئەگەر نەدەی، بەختەوەری «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ▬ فرصت را از دست دادن

**دەرفەت (لێ) هێنان:** لە دەرفەت کەڵک وەرگرتن ‹دەرفەتی (لێ) هێنا و ڕفاندی› ▬ فُرصت را غنیمت شُمردن

**دەرفەتهێن** / derfethên/: ئاوەڵناو. کەیسۆ؛ هەلپەرست ▬ فُرصت‌طلب

**دەرڤە** / derve/: ☜ دەرەوە

▣ **دەرڤە دان:** ☜ دەربڕین

**دەرڤەیی** / derveyî/: ئاوەڵناو. غەوارە؛ غەیارە ▬ بیگانە

**دەرق** / derq/: ناو. ڕیقنە؛ ڕێقنە؛ جیقنە ▬ چلغوز

**دەرقەد** / derqed/: ئاوەڵناو. پێبەند؛ دەربەست؛ دەربایس ▬ پایبند

▣ **دەرقەد نەهاتن:** لا گرنگ نەبوون؛ گوێ پێ نەدان ▬ اهمیت ندادن

**دەرقەل** / derqel/: ناو. پارچە زەوییەکی کەم و بچووک ▬ قطعه زمین کوچک

**دەرقیل** / derqîl/: ناو. هێچک؛ ئاڵقەی داریـنی سەر گوریسی باربەند ▬ حلقەی چوبین سر طناب باربندی

**دەرک** / derk/: ناو. ١. درگا؛ دەرکە ٢. فام؛ ئاوەز؛ سەرەدەر؛ سەرودەر؛ دۆخی ئاوەزین؛ زانین و لە شتێک تێگەیشتن ▬ ١. در ٢. درک

▣ **دەرک بوون:** دەرهاتنی چلک و کێمی برین و دمەڵ‹دمەڵەکە دەرکی بووە› ▬ بیرون آمدن چرک دُمل

**دەرک داخستن:** درگا بەستن ▬ در را بستن

**دەرک/ دەرکە لە کەسێ داخستن:** درگا بە سەر کەسێکەوە بەستن ‹دەرکی لە تۆ داخستووە بابت کەچی دەرکی نییە/ دەرکە داخستن لە تۆ دەرکی ئومێد داخستنە «هێمن»› ▬ در را به روی کسی بستن

**دەرک کردن:** ئاوزان؛ ئاوزیان؛ فامین؛ تێگەیشتن ▬ درک کردن

**دەرکـران / derk(i)ran/**: چـاوگ. ١. وە دەر نـران ‹هەڵبڕاوم من لە یاری نازەنین/ دەرکـراوم مـن لـە خاکی دڵنشین «هـێمن»› ٢. دەرچـوون؛ فـەرمان دران ‹ساڵـێک زینـدانی بـۆ دەرکـرا› ٣. لـێ دەرچـوون؛ کـەم کرانـەوە ‹ئـەم بەشـەی دەرکـرا، چواری ماوە› ☰ ١. اخـراج شـدن ٢. صـادر شـدن ٣. کسر شدن

**دەرکـراو / derk(i)raw/**: ئاوەڵـناو. دەرکریـاگ؛ دەرکریاو: ١. وە دەرنراو؛ بەرهەڵداکراو ٢. لە سەر کار لانراو ٣. کەمکـراو ☰ ١. رانـدە شـدە ٢. اخـراج شدە ٣. منها شدە

**دەرکردن / derkirdin/**: چاوگ. ١. وە دەر نان ‹لـە ماڵ دەرکردن› ٢. بە نەشتەر کردنەوەی بـرین ٣. دەردان؛ هێنانـە ڕوو ‹زیپکـە دەرکـردن؛ لـک دەرکردن› ٤. خستن؛ هاویشتن ‹تـیر دەرکـردن› ٥. لە حیساب یان لـە فرۆشـراو کـەم کـردن ٦. دانی فەرمان یا بەرایی کار لە لایەن بەرپرسێکی فەرمییەوە ‹حوکم دەرکردن› ٧. *[کینایە]* لـە چـاپ دان و بڵاو کردنەوە ‹کتێب دەرکردن› ☰ ١. راندن؛ بیرون کـردن ٢. نشـتر زدن زخـم ٣. بیـرون زدن ۴. انداختن ۵. از حساب کم کردن ۶. صادر کردن (حُکم) ۷. انتشار دادن

**دەرکردە / derkirde/**: نـاو. حوکم؛ بـڕیار؛ فـەرمانی فەرمی ☰ حُکم

**دەرکریاگ / derkiryag/**: ☜ **دەرکراو**

**دەرکریاو / derkiryaw/**: ☜ **دەرکراو**

**دەرکشان / derk(i)şan/**: چاوگ. شـتێ لـە شـتێ دەرهاتن ☰ برکشیدە شدن

**دەرکشاو / derk(i)şaw/**: ☜ **دەرهاتوو**

**دەرکوبـان / derk û ban/**: نـاو. درگاوبـان؛ بەردرگانـە؛ دەر و دوو؛ دەور و بـەری مـاڵ ☰ پیرامون خانە

**دەرکوت / derkut/**: نـاو. دەرکوتـک؛ دەرتـەقێن ☰ درکوبە

**دەرکوتک / derkutik/**: ☜ **دەرکوت**

**دەرکودوکـان / derk û dukan/**: ناو. *[پلار]* دەزگـای حوکمەت ☰ رژیم

**دەرکودو / derk û dû/**: ناو. *[مەجاز]* ماڵ و حاڵ ☰ خانە و کاشانە

**دەرکودەروازە / derk û derwaze/**: ناو. کـۆی ئـەو کەرتانە کـە لـە خـانوو یـان دامەزراوەیەکـدا بـۆ هاتوچۆ دەبن ‹ئەو کچە لەو ماڵە قەولی داوە پـێم/ دەرکـودەروازەی داخراوە لێم! «فولکلۆر»› ☰ درهای ورودی و خروجی

**دەرکە / derke/**: ناو. دەرک؛ درگا ☰ در

**دەرکەتن / derketin/**: ☜ **دەرکەوتن**

**دەرکەزا / derkeza/**: ☜ **خانەزا**

**دەرکەفتن / derkeftin/**: ☜ **دەرکەوتن**

**دەرکەفتە / derkefte/**: ☜ **دەرکەوتە**

**دەرکەنار[1] / derkenar/**: نـاو. پەراوێزی نووسـراو ☰ هامش؛ حاشیەی کتاب

**دەرکەنار[2]**: ئاوەڵـناو. بێلایەن؛ خۆ دە کار نەگـەیێن ☰ بی‌طرف

**دەرکـەوان / derkewan/**: ناو. درگـاوان؛ دەرگـەوان ‹دەرکت نییە، دەرکردن مەگرە!› ☰ دربان

**دەرکـەوت / derkewt/**: نـاو. شـوێنەوارێ کـە لـە دیـاردە یـان کارێـک بـەجێ دەمێنێتـەوە ‹دەرکەوتەکانی نەخۆشی ئەیدز› ☰ نشانە

**دەرکـەوتن / derkewtin/**: چـاوگ. دەرکـەتن؛ دەرکـەفتن: ١. دەرچـوون؛ چوونـە دەرەوە ‹سەیدێکی خڕکەلە، هەموو گیان فیشەک و دەمانچە و تفەنگ، لەکەنداڵی کانییـەک دەرکـەوت و هـەرای کرد: فەقێ ئاگرت پێیە؟ «هەژار، چێشتی مجێـور»› ٢. ئاشکرا بوون؛ دیـاری دان ‹ئـەی وەتـەن! هـیچ خەم مـەخۆ ڕۆژێ ئـەبێ بـۆ ئـاخری/ دەسـتی بـەیزا دەرکەوێ سیحری نەمێنێ سامیری «قـانع»› ☰ ١.

بیرون رفتن ۲. آشکار شدن

**دەرکەوتو / derkewtû/:** ☜ **دەرکەوتە**

**دەرکەوتــە / derkewte/:** ئاوەڵــناو. دەرکەفتـــــە؛ دەرکـەوتوو: ١. دەرچـووگ؛ لـە ماڵـدا نـەماو ٢. ئاژەڵـی تـەرە بـوو لـە ڕان ٣. خویـا؛ ئاشـکرا ٤. هەڵاتوو؛ تەرە ☰ ١. بیـرون رفتـه ٢. حیـوان از گلـه بُریده ٣. آشکارشده ۴. فراری

**دەرکێشان / derkêşan/:** چـاوگ. کێشـانه دەرەوە؛ بەرکێشتەی؛ کرێشتەیش؛ کرانتش؛ دەرهێنان له شوێنی خۆی ☰ آختن؛ بیرون کشیدن

**دەرکێشـراو / derkêşraw/:** ئاوەڵــناو. هەڵکشـــاو؛ وەرانتا ☰ برکشیده؛ آخته

**دەرگا / derga/:** ☜ **درگا**

◘ **دەرگا بون:** ☜ **درگا بون**

**دەرگا کردن:** ☜ **درگا کردن**

**دەرگـابێن / dergabên/:** نـاو. زاربـێنی دەفـر ☰ دهانەبند ظرف

**دەرگاخن / dergaxin/:** ئاوەڵناو. پڕاوپڕ؛ تـژە؛ لچـان ☰ پُر؛ لبالب

**دەرگانە / dergane/:** نـاو. دراوێ کە بۆ چوونە ژوور دەبێ بدرێ ☰ ورودی

◙ **دەرگانەی ڕەحمەت:** درگانەی ڕەحمەت؛ دەرگای دابینکەری هەموو جۆرە ئاتاجێک ☰ بابُ‌الحوائج

**دەرگست / dergist/:** ☜ **درگستی**

**دەرگستی / dergistî/:** ناو. دەرگست؛ دەزگـیران ☰ نامزد

**دەرگڤانـک / dergvanik/:** نــــاو. دەرخۆنـــــــە؛ دەرخووینک؛ سەرپۆشی دەفر ☰ درِ ظرف

**دەرگوش / derguş/:** ☜ **درگوش**

**دەرگوشادانە / derguşadane/:** ناو. بانگهێشـت بـە هۆی چوونە ناو خانووی تازەوە ☰ سور خانەی تازە

**دەرگوشک / derguş(i)k/:** ☜ **درگوش**

**دەرگووش / dergûş/:** ناو. دەرگوش؛ دەرگوشک: ١. لانـک؛ دەیـدیک؛ بێشـکە ٢. جۆلانـەی تێـدا نووستنی منال ٣. ساوای تازەزاو ☰ ١. گهـواره ٢. ننو ٣. نوزاد

**دەرگووشـاندن / dergûşandin/:** چـاوگ. ڕاژانـدنی دەرگووش ☰ جنباندن

**دەرگووشین / dergûşîn/:** چاوگ. ڕاژانی دەرگووش ☰ جنبیدن

**دەرگە / derge/:** ناو. درگا ☰ درگاه

**دەرگەوان / dergewan/:** ☜ **دەرکەوان**

**دەرگیر / dergîr/:** ئاوەڵناو. تێوەگلاو ☰ درگیر

**دەرگیل / dergîl/:** ☜ **دەرمەنجێڵە**

**دەرلنگ / derling/:** ☜ **دەرەلنگ**

**دەرلینگ / derlîng/:** ☜ **دەرەلنگ**

**دەرم / derm/:** ناو. بەرمیل؛ بۆشکە ☰ بُشکه

**دەرماڵ / dermał/:** نـاو. ١. بـەردرگا ‹کەمووتـەر وە باڵ کۆرکۆر وە سینە/ له دەرماڵـەگەد بکـردام چینـه «فولکلۆر»› ٢. کەمەربەنـدی ڕەشمـاڵ ٣. *[کنایە]* ماڵەگەورە ☰ ١. جلو در ٢. پارچەی کمربند چـادر ٣. بارگاه

**دەرماڵە[1] / dermałe/:** ناو. دەرماڵـی: ١. بێچـووی درەنگـزاوی ئاژەڵ کە لە ماڵدا دەهێڵـدرێتەوە ٢. نۆکەرێ کە منداڵـی ماڵـەگەورە بـێ ٣. مووچـە؛ مواجوو؛ مانگانە ☰ ١. نوزاد دیرزای دام کە در خانـه نگهدارند ٢. نوکر خانەزاد ٣. حقوق

**دەرماڵە[2]:** ئاوەڵناو. دەرماڵـی؛ دابەسـتە؛ پـەروار ☰ پرواری

**دەرماڵی / dermałî/:** ☜ **دەرماڵە**

**دەرمـان / derman/:** نـاو. دەرمـوو: ١. دەوا؛ داروو؛ دەرمانک؛ دوای؛ ئەوەی بۆ چارە کردنی دەرد یـا بەرگری له نەخۆشی یـان بـەهێز کـردنی لـەش بەکار دەچێ ٢. چارە؛ عیلاج ‹نەبوو دوکتۆرێ زانـا تێ بگا دەردم چ دەردێکە/ تەواو بێـزارم ئەمرۆکـە لـە دەس دەرمانـــی کوێرانـە «قـانع»› ٣. بـارووت ٤.

مـاکی کیمیـایی 🇮🇷 ١. دارو ٢. عـلاج ٣. بـاروت ۴. مادەی شیمیایی

▣ **دەرمـان پـێ دان**: ١. دەوا پـێ دان بـۆ چـاک بوونەوە لە نەخۆشی ٢. دەرمانخوارد کـردن 🇮🇷 ١. دارو دادن ٢. مسموم کردن

**دەرمان کردن**: چارە کردنی دەرد و برین 🇮🇷 مداوا کردن

**دەرمانجە** / dermance/: ☜ دەمانچە

**دەرمانچا** / dermança/: ناو. چـای وشـک؛ چـای هێشتا لێنەنراو 🇮🇷 چای خشک

**دەرمانچە** / dermançe/: ☜ دەمانچە

**دەرمانخانە** / dermanxane/: ☜ دەواخانە_١

**دەرمانخوار** / dermanx(i)war/: ☜ دەرمانخوارد

**دەرمـــانخوارد** / dermanx(i)ward/: ناوەڵـــناو. دەرمـــانخوار؛ دەرمـــانخواردوو؛ دەرمـــانخـــۆر؛ دەرمانـداو؛ ژەهرخـواردوو؛ ژار دەرخـوارد دراو 🇮🇷 زهرخور

**دەرمـــــانخواردو** / dermanx(i)wardû/: ☜ دەرمانخوارد

**دەرمـــانخۆر** / dermanxor/: ناوەڵـــناو. ١. ☜ دەرمانخوارد ٢. دۆخی نەخۆشێ کـە دەرمـان بـۆ چارەی نەخۆشی دەخوا 🇮🇷 ١. ☜ دەرمانخوارد ٢. حالت بیماری کە دارو می‌گیرد

**دەرمانـــدان** / dermandan/: نـــاو. ســـــندووقی دەرمانفرۆش 🇮🇷 تبنگو؛ جونە

**دەرمانداو** / dermandaw/: ☜ دەرمانخوارد

**دەرمانساز** / dermansaz/: ☜ دەواساز

**دەرمانفرۆش** / dermanf(i)roş/: ☜ دەوافرۆش

**دەرمانک** / dermanik/: ناو. ١. بـەهارات؛ ئـالات و زەردەچێوە ٢. دەوا؛ دەرمان 🇮🇷 ١. ادویە ٢. دارو

**دەرمـانکوت** / dermankut/: ناو. کەسێ کە بـارووت ساز دەکا 🇮🇷 باروت‌ساز؛ باروت‌کوب

**دەرمانکـەر** / dermanker/: ناوەڵـناو. چارەســـازی نەخۆش و بریندار 🇮🇷 تیمارگر

**دەرمانگا** / dermanga/: ناو. دامەزراوەیەک بە کادر و ئامێری پزیشـکی پێویسـتەوە بـۆ چارەسـەری نەخۆشانی سەرپایی 🇮🇷 درمانگاە

**دەرمانگەر** / dermanger/: ☜ دەواساز

**دەرمانناسی** / dermannasî/: ناو. فارمـاکۆلۆژی 🇮🇷 داروشناسی

**دەرمانەئازار** / dermane'azar/: ناو. گوڵـەدەوری؛ ڕەگەڕووتـە؛ گوڵـەئێش؛ گیایـەکی ئـالیکی و ڕازێنـەیی، بـە لاسـکی بچـووک و زۆر، گـەڵای تووکن بە ڕەنگی کەسکی ئاماڵ شین و دوو جـۆر گوڵـەوە، ڕەگ و گـەڵا و گوڵـەکەی بۆنخۆشـە و کەڵکی دەرمانیشی هەیە 🇮🇷 عاقرقرحا

**دەرمانەحەفو** / dermaneĥefû/: ناو. دڕکەبوولینە؛ دڕکەکەوە؛ دڕووەشینە 🇮🇷 خار نقرەای

**دەرمانـــەدیان** / dermaned(i)yan/: نـــاو. گیـــای کەفێنە 🇮🇷 غاسول؛ گیاە صابونی

**دەرمانـــــــــەگمێز** / dermaneg(i)mêz/: ☜ دەرمانەمیز

**دەرمانـــەگوێ** / dermaneg(i)wê/: نـــاو. گیـــای مارەمێ 🇮🇷 گل مریم

**دەرمانەلەرز** / dermanelerz/: ناو. گەنـە ـ گەنـە؛ یاوکوژە؛ دەرمانێکی دژی یاو و لەرزە، بـرێتی لـە ماکی کینین، کە لە تێکوڵی دارێکی دایمە شینی تایبەتی ناوچەی گەرم و شێدارە 🇮🇷 گنە_گنە

**دەرمانـەمیز** / dermanemîz/: نـاو. دەرمانـەگمێز؛ گیایەکە دژی چرکەمیزەیە 🇮🇷 سنبل ختایی

**دەرمو** / dermû/: ☜ دەرمان

**دەرمـەجێل** / dermecêl/: نـــاو. دەروەنجەڵـــە؛ دەرمەجێلە؛ پەنجەرەی کون_کون لە دار کە ئـەو دیوی لێ دیار بێ 🇮🇷 غَلْبَکن

**دەرمەجێلە** / dermecêle/: ☜ دەرمەجێل

**دەرمەجێڵە**[1] / dermecêłe/: ناو. چەپەر؛ درگای بـە

تووڵ تەنراو ☰ درب چپَر

**دەرمەجێڵە**[٢]: ئاوەڵناو. لـەڕولاواز و بـێ‌گیـان ☰ لاغرمُردنی

**دەرمەنجلە** / dermenc(i)łe/: ☜ **دەرمەنجێڵە**

**دەرمەنجێڵـە** / dermencêłe/: نـاو. دەرمەنجلـــە؛ دەربەنجەلە؛ دەرگیل؛ درگای لە تووڵ تـەنراو ☰ درِ بافته از ترکه

**دەرمەنـە** / dermene/: ئاوەڵناو. قـەتیس؛ دامـاو ☰ درمانده

**دەرنـاق** / dernaq/: نـاو. قرقـــرتۆک؛ قرقراچکـــە؛ قوراچکە؛ بینەقاقە ☰ خِرخِره

**دەرنجە** / derince/: ☜ **دەرەج**

**دەرنخـوون**[١] / dern(i)xûn/: نـــاو. دەرنـــەخوون؛ دەرخۆنەی سەر تەندوور ☰ نهبان تنور

**دەرنخوون**[٢]: ئاوەڵناو. دەرنـەخوون؛ سـەرەونخوون؛ وەرگەڕاو ☰ واژگون

**دەرنشێڤ** / dern(i)şêv/: ئاوەڵناو. بەراوەژوو؛ واژی؛ سەرەوخوار ☰ وارونه

**دەرنەخوون** / dernexûn/: ☜ **دەرنخوون**

**دەرنـەخین** / dernexîn/: چـاوگ. لـــە ســـەر زگ ڕاکشان بۆ ئاو خواردنەوە لە کانی ☰ دمر خوابیـدن برای آب خوردن از چشمه

**دەرو** / derw/: نـاو. ١. دەروو؛ دەرگـــا؛ درگـــا ٢. گەڵی تەنگەبەر؛ شیوی تەنگ؛ دۆڵـی تەسـک ☰ ١. در ٢. درّەی تنگ

▣ **دەروی ڕەحمەت**: دەرگای ڕەحـمـەت؛ دەرفـەتی ڕزگار بوون ☰ راه نجات

**دەروازە** / derwaze/: ناو. ١. قاپیە؛ دەرگـای گـەورە (بەتایبەت درگای شار یان قەڵا) ‹باڵا کەردەوە مـەیل ئـەو لای پەسـتی/ وردیکلانـەن دەروازەی هەسـتی «مەولەوی»› ٢. [وەرزش] گوڵ؛ گۆڵ؛ شوێنی تۆپ تێ‌خستنی یاری فووتبـاڵ و چەنـد یـاری‌تـر بـۆ وەرگرتنی پشک ٣. [مـەجاز] شوێنی تێوەچوون بۆ شوێنێکی‌تر ☰ ١تا٣. دروازه

**دەروازەبان** / derwazeban/: ☜ **دەروازەوان**

**دەروازەوان** / derwazewan/: نـاو. دەروازەبـان: ١. دەروان؛ دەرکەوان؛ قاپیـەوان؛ نـواوان ٢. گۆڵـێر؛ یاریزانێ کە لە دەروازەیە، تۆپی تـێ نـەچێ ☰ ١. دربان ٢. دروازه‌بان

**دەروان** / derwan/: ☜ **دەروازەوان ـ١**

**دەروان‌پشت** / derwanpişt/: ناو. دەوروبەر؛ حەول و حەوش؛ دەوروپشت ☰ پیرامون؛ حوالی

**دەروایسـی** / derway(i)sî/: نـاو. ئاتـــاج؛ نیـــاز ☰ حاجت؛ نیاز

**دەروبان** / der û ban/: ناو. دەرودوو؛ دەر و دیـوار؛ دەرک‌وبان؛ درگا و بان؛ بەردرگانە؛ دەور و بـەری ماڵ ☰ پیرامون خانه

**دەرودراوسێ** / der û d(i)rawsê/: ناو. جیرانـان ☰ در و همسایه

**دەرودو** / der û dû/: ☜ **دەروبان**

**دەرودەشت** / der û deşt/: ناو. دەشت‌ودەر: ١. چۆڵ و سارا؛ بەدەر لـە ئـاوایی ٢. دەرەوە؛ دەرەڤـە ٣. [مەجاز] سروشت؛ تەبیعەت ‹موو سونبول و ڕوومەت گوڵ و هەم لالە کـولاهن/ گوڵـزاری دەرودەشتـــن و غیلمانی بەهەشتن «نالی»› ☰ ١. در و دشت ٢. بیرون ٣. طبیعت

▣ **دەرودەشت کـردن**: لـە مـاڵ چوونـە دەر ‹بـاوکم نەخۆشە ناتوانێ دەرودەشت بکا› ☰ بیرون رفتن

**دەرودیوار** / der û dîwar/: درگا و بان؛ دار و دیوار؛ ئـــەوەی ئاقارێـــک لـــە دەرەوەی خـــۆی جـــوێ دەکاتەوە (وەک دیوار و دەرگا و پەنجـەرە) ☰ در و دیوار

**دەروژوور**[١] / der û jûr/: ناو. ١. لای سەرەوە و بنەوە (قوماش و...) ٢. دیوی دەر و ناو ‹دەروژووریان بـە ئاوێنـە ڕازانـدبۆوە› ☰ ١. رویـە و داخـل ٢. بیـرون و اندرون

▣ **دەروژوور کردن**: ١. هاتوچۆی دەرموە کردن ‹هێندەت دەروژوور کرد، ماندوو بووی› ٢. *[مەجاز]* بەرەو چابوون چوونی نەخۆش ٣. *[کینایە]* تازە پا گرتنی منداڵ ⇐ ١. داخل و خارج شدن ٢. شروع شفا یافتن ٣. پا گرفتن بچه

**دەروژوور**[٢]: ئاوەڵناو. ئاشکرا و نادیار ⇐ آشکار و پنهان

**دەروەچ** / derweç/: ☞ **دەروەچە**

**دەروەچار** / derweçar/: ناو. سنوور؛ کەوشەن؛ مەرز ⇐ مرز

**دەروەچە** / derweçe/: ناو. دەروەچ؛ دەلاقە ⇐ پنجره

**دەروەدەر** / derweder/: ☞ **دەربەدەر**

**دەروەدەری** / derwederî/: ☞ **دەربەدەری**

**دەروەن**[١] / derwen/: ناو. دەروەند: ١. دەربەند ‹لە کام دەروەن دەوار هەڵدایدە؟› ٢. زاربین ⇐ ١. دربند ٢. دهانەبند

**دەروەن**[٢]: ئاوەڵناو. ١. گیرۆدە ٢. لە فیکردا بوو ٣. دەربەند؛ پابەند ⇐ ١. گرفتار ٢. اندیشناک ٣. پایبند

▣ **دەروەن بوون**: پابەند بوون ‹موسوڵمان دەبێ دەروەنی دین بێ› ⇐ پایبند بودن

**دەروەن نەهاتن**: پێ سەخت نەبوون؛ زۆر بایەخ پێ نەدان ‹دەروەن خۆم نایەم، خەفەت منالەکانمە› ⇐ اهمیت ندادن

**دەروەنجەڵە** / derwenceɫe/: ☞ **دەرمەجیل**

**دەروەند** / derwend/: ☞ **دەروەن**[١]

**دەرویش** / derwîş/: ☞ **دەروێش**

**دەروێش**[١] / derwêş/: ناو. دۆرێش؛ دەورێش؛ دوریش؛ دەرویش: ١. کەسێ کە شوێنەڕای یەکێک لە لقەکانی سۆفیگەرییە ‹بە ڕەنگی زەرد و شێوەی دەستوشمشالی کزا، دەروێش/ حەزم کرد بەستەیەک ببیەم سەراسەر حوزن و ماتەم بێ «گۆران»› ٢. ڕیتاڵە؛ ڕینگاڵ؛ قەلەندەر؛ عەبدال؛ بریگەرد؛ کەسێکی گەڕاڵ کە بە جلوبەرگێکی تایبەت و کەشکۆڵ و تەوەرزینەوە بە کووچە و کۆلاناندا دەگەڕێ و شیعر دەخوێنێ و شمشاڵ دەژەنێ و لە خەڵکی پارە دەستێنێ ⇐ ١و٢. درویش

**دەروێش**[٢]: ئاوەڵناو. دۆرێش؛ دەورێش؛ دوریش؛ دەرویش: ١. *[مەجاز]* سەرپەتی؛ گوێنەدەر بە دنیا و ماڵ و سامان و ناوبانگ و پلە و پایە ٢. *[ئەدەبی]* ڕەبەن؛ هەژار ⇐ ١و٢. درویش

**دەروێشگە** / derwêşge/: ناو. تەکیە ⇐ خانقاه

**دەروێشەمارە** / derwêşemare/: ☞ **کرمەتووکنە**

**دەرۆزان** / derozan/: چاوگ. ماڵینی ژێری خەرمان ⇐ روفتن زیر خرمن

**دەرۆزە** / deroze/: ناو. پارسەکی؛ گەدایی ‹دەستی دەرۆزەمان پان بوو/ چاومان زەق ـ زەق چاوەڕوان بوو «گۆران»› ⇐ گدایی

**دەرۆزەکەر** / derozeker/: ناو. دەریۆزەکەر؛ پارسەک؛ گەدا ⇐ گدا

**دەرۆزەیی** / derozeyî/: ناو. سواڵکەری؛ دەرۆزەیی؛ پارسەکی ⇐ گدایی

**دەرۆست** / derost/: ↓

▣ **دەرۆست هاتن**: ١. پێوەستان؛ دەرەقەت هاتن ٢. دەربردن ⇐ ١. زور رسیدن ٢. تحمل کردن

**دەرۆم** / derom/: ناو. گە؛ مان ⇐ اعتصاب

**دەروو** / derû/: ناو. دەرو؛ دەرەتان؛ ڕێگەی دەرچوون ‹هەرچەندە کە نیمە هیچ دەرووی ڕوون/ هەر دژ دەگەڕێ گەڕانی گەردوون «هەژار، *ئاڵەکۆک*»› ⇐ مفر؛ گریزگاه

**دەروون** / derûn/: ناو. ١. ئەندەروون؛ ژوور؛ ناو ٢. ڕەوان؛ سەرجەمی توخم و هێزەکانی هزر، سۆز و ئاکاری مرۆڤ ‹لێکدانەوەی دەروون، قسەی زمانم/ بۆچی وەها دوورن لە یەک؟ نازانم «گۆران»› ⇐ ١. درون ٢. روان

**دەروونبینی** / derûnbînî/: ناو. توێژینەوە و تاوتوێی

بیر و باوەڕ و هەستی خۆ ☰ درون‌بینی

**دەرووندار** / derûndar/: ئاوەڵناو. [مەجاز] ١. بە جەرگ؛ جوامێر ٢. نهێنبڕ؛ خۆڕاگر ☰ ١. پُردل ٢. تودار

**دەروونکۆڵی** / derûnkołî/: ناو. ڕەوانکۆڵی؛ دەروون‌ناسی؛ شیکاریی ڕەوان؛ شێوازێکی دەروون‌ناسی کە زیگموند فرۆید (١٨٦٥-١٩٣٩ زایینی) دایهێنا و جەخت دەکاتە سەر هەڵدانەوەی ڕابردوو، هەڵس‌وکەوتی بنەماڵەیی، ئەوین و هەویاگەلی نەخۆش، بۆ دۆزینەوەی هۆی نەخۆشی و ناساندنی بە خودی نەخۆش و هاندانی بۆ بەرەنگار بوونەوە لەگەڵیاندا ☰ روانکاوی

**دەروون‌ناسی** / derûnnasî/: ناو. ڕەوان‌ناسی؛ زانستی لێکۆڵینەوەی دیاردە و کارکردەکانی دەروون (وەک: هزر، بیر، هەست، تێگەیشتن، تێفکرین، ئاکار) و شێوەی ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئاڵۆز بوونیاندا ☰ روانشناسی

**دەروونی** / derûnî/: ئاوەڵناو. ١. هۆندۆری؛ سەر بە نێوەوە ٢. ڕەوانی؛ سەر بە دەروون ☰ ١. درونی ٢. روانی

**دەرە**[1] / dere/: ناو. ١. گەلی؛ شیو؛ دۆڵ ‹دەرەو لوهۆنی› ٢. کارد؛ چەقۆی گەورە ٣. ماوە؛ دەرفەت ☰ ١. درّە ٢. کارد ٣. مُدت

**دەرە ـ**[2]: پێشوشە. ١. پێش؛ دەرگا؛ دەرکە ‹دەرەلنگ› ٢. شوێن؛ شۆن ‹دەرەدوا› ٣. درێژەدار ‹دەرەبۆل› ☰ ١. در ٢. جا ٣. ادامەدار

**دەرەبوار** / dereb(i)war/: ناو. سەرەتای بەهار ☰ اول بهار

**دەرەبۆڵە** / derebołe/: ناو. جۆرێ ترێی سووری دەنک گەورە ☰ نوعی انگور

**دەرەبەگ** / derebeg/: ناو. مەزنی زۆر بە دەسەڵات ☰ خان بزرگ

**دەرەبەگایەتی** / derebegayetî/: ناو. دەزگایەکی کۆمەڵایەتی و ئابووری کە بەگ خاوەنی هەموو شتێکە و بە کەڵک وەرگرتن لە کاری ڕەنجبەر، بەرهەمی زیادەی دەست دەکەوێت ☰ ارباب و رعیتی

**دەرەبەگی** / derebegî/: ناو. ١. ڕژێمی بێ‌دەوڵەت و بەرحوکمی خان و ئاغایان ٢. [کینایە] زۆرداری و کەڵەگایی ☰ ١. خان‌خانی؛ ملوک الطوایفی ٢. زورگویی

**دەرەتان** / deretan/: ناو. ویستە؛ دەرو؛ بوار؛ ڕێگەی دەرباز بوون ‹زیندانە ژیانم، دەرەتان نابینم/ ئاڵۆز و گرێ‌پووچکەیە ئەو هەودایە «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ مفر

**دەرەج** / derec/: ناو. دەرنجە: ١. پلەی نەردیوان ٢. پلیکان؛ پلەکان؛ قالدرمە ☰ ١. پلەی نردبان ٢. پلە؛ نردە

**دەرەجە** / derece/: ناو. ١. [ریازی] پلەک؛ یەکەی ئەندازە گرتنی گۆشە و کەوانی جەغز ٢. پلەک؛ یەکەی پێوانی گەرما ٣. پلە و پایە ٤. نمرە؛ پلە و پایە لە ڕوانگەی چۆنیەتییەوە ‹لە قەتار، ژووری دەرەجە یەکمان گرت› ☰ ١تا٤. درجە

**دەرەجەدار** / derecedar/: ناو. هەرکام لە ئەندامانی هێزی چەکداری ئێران لە سەردەستەوە تا پێش ئەفسەری ☰ درجەدار

**دەرەدزە** / dered(i)ze/: ناو. ڕەوتی خۆ دزینەوە لە کار ☰ عمل از زیر کار دررفتن

⊡ **دەرەدزە پێ دان**: خۆ دزینەوە؛ فیزماڵک دان ☰ جیم شدن

**دەرەدوا** / dered(i)wa/: ناو. کار و ڕەوتی شوێن کەفتن؛ دانە دوو ☰ پیگیری

⊡ **دەرەدوا بوون**: دانەپەی؛ وە دوا کەوتن ☰ پیگیری کردن

**دەرەدەوا** / deredewa/: ناو. پۆخەڵە؛ کەرکۆل؛

بابردۆک؛ پوورئاشۆکە؛ گیایەکە بە لق و پـۆی زۆر و ڕیشـــەی ناســـکەوە، بـــا هەڵـــیدەکەنێ و هەڵیدەسووڕێنێ ☰ آبلک؛ بادآورد

**دەرەڕا** / dereřa/: ☜ **دەرەڕە**

**دەرەڕت** / dereřet/: ☜ **دەرەڕە**

**دەرەڕە** / dereře/: نـــاو. دەرەڕا؛ دەرەڕەت؛ دەرەڕت؛ دەرەورێ؛ باغ و زەمینی دوور لـە ئـاوایی ☰ ملـک دور از آبادی

**دەرەڕەت** / dereřet/: ☜ **دەرەڕە**

**دەرەڤۆک** / derevok/: ناو. دیرۆک ☰ افسانه

**دەرەقەت** / dereqet/: ↓

⊡ **دەرەقەت هاتن**: پێوەستان؛ دەرۆست هـاتن ☰ زور چربیدن

**دەرەک**[1] / derek/: نـــاو. ١. تـــوون؛ دۆژە؛ بـــنی جەحـــەننم ٢. پۆلیســـی دەری شـــار ٣. شـــوێنی نەناس ☰ ١. دَرَک ٢. پلیس بـرون شـهری ٣. جـای ناشناس

▣ **بە دەرەک**: بە توون؛ بە جەحەننم ☰ به دَرَک

**دەرەک**[2]: ئامراز. گەرچی؛ ئەگەرچی ☰ گرچه

**دەرەکە** / dereke/: ناو. دەرەگە؛ دەرەوە. بەرانبـەر: **ناوەوە** ☰ خارج

**دەرەکی**[1] / derekî/: نـاو. پۆلیســـی دەری شـــار ☰ پلیس برون شهری

**دەرەکی**[2]: ئاوەڵـناو. ١. پێوەندیـدار یـان سـەر بـە دەرەوە ‹ڕووکـاری دەرەکـی› ٢. لاوەکـی؛ بیـانی ‹هێزی دەرەکی› ☰ ١و٢. خارجی

**دەرەگوژنوو** / deregujnû/: ناو. سەرپۆشـی گـۆزە و تۆنگە ☰ سرپوش تُنگ و سبو

**دەرەگە** / derege/: ☜ **دەرەکە**

**دەرەلنگ** / dereling/: ناو. دەرلنگ؛ دەرلینـگ: ١. دەلینگە؛ دەرپێ و ڕانک؛ ئەو بەشە لە بـەرگ کـە بەلەکی پێ دادەپۆشـێ ٢. نـاوەوەی دوو پـا، لـە ئەژنۆ بەرەژێر ☰ ١. پاچەی شـلوار ٢. میـان پاهـا از قوزک تا زانو

**دەرەلنگدڕاو** / derelingd(i)řaw/: ئاوەڵـناو. /کنایە/ ڕووت و شڕۆڵ ☰ ژندەپوش

**دەرەنجـام** / derencam/: نـاو. بـەتاوار؛ ئاکـام ☰ عاقبت

**دەرەو**[1] / derew/: ناو. ١. ☜ **دەرەوە**[1] ٢. ☜ **درۆ**

**دەرەو**[2]: ☜ **دەرەوە**[2]

**دەرەورێ** / derew(i)rê/: ☜ **دەرەڕە**

**دەرەوشار** / derewşar/: ئاوەڵناو. شـاربەدەر ☰ نفـی بلد

**دەرەوە**[1] / derewe/: نـاو. دەرڤـــە؛ دەرەو: ١. دەر ‹چووینە دەرەوە› ٢. لای بەرچاو ‹دەرەوەی جوانە، ناوەوەی نـازانم› ٣. هەنـدەران؛ وڵاتـانی لاوەکـی ‹میوانی دەرەوە› ☰ ١. بیرون ٢. رویه ٣. خارج

**دەرەوە**[2]: ئاوەڵـکار. دەرڤـــە؛ دەرەو؛ لـــە دەر ‹بچـــۆ دەرەوە!› ☰ بیرون

**دەرەوین** / derewîn/: ☜ **درۆزن**

**دەرەوێر** / derewêr/: ئاوەڵـناو. درۆزن؛ فشـەکەر ☰ دروغگو

**دەرەوێرە** / derewêre/: ☜ **درۆزن**

**دەرهاتگ** / derhatig/: ئاوەڵـناو. ١. دەرکێشـراو بـۆ دەرەوە ٢. ڕاهێنراو؛ فێرەکارکراو ☰ ١. برکشیده ٢. کارآزموده

**دەرهاتن** / derhatin/: چاوگ. ١. هاتنە دەر؛ هاتنە دەرەوە؛ لە جێگایەکی (زۆرتر داخـراو) دەرکـەوتن ‹لە ماڵ دەرهاتن؛ لە چالاو دەرهـاتن› ٢. هـەڵاتن؛ هەڵهاتن؛ دەرکەوتن؛ کەفتنە دەرەوە ‹دەرهاتنـی مانگ› ٣. ڕوان؛ هاتنە دەر؛ سەر هەڵـدان؛ سـەوز بوون؛ شین بوون ‹ڕدێن دەرهاتن؛ گوڵ دەرهـاتن› ٤. ئامانج دان ‹خراپ دەرهاتن؛ درووس دەرهـاتن› ٥. بە دەست هاتن ‹پارە دەرهاتن؛ ئاو دەرهاتن› ٦. دەرکەوتن؛ بەدیهاتن ‹لە پێمدا مێخچە دەرهاتبوو› ٧. لە چاپ دران؛ چاپ یان بلاو بوونەوە ‹ڕۆژنامـە

دەرهاتن؛ کتێب دەرهاتن› ٨. ڕاهاتن لە کار ‹لە کار دەرهاتن› ٩. لە نێو وێنە و فیلمدا جێ بوونەوە و دەرکەوتن ‹لە فیلمەکەدا جوان دەرهاتبوو› 📖 ١تا٩. درآمدن

**دەرهاتـــو** / derhatû/: ئاوەڵـــناو. ١. دەرکشـــاو ٢. ڕاهاتوو 📖 ١. برکشیده ٢. آزموده

**دەرهانین** / derhanîn/: ☜ **دەرهێنان**

**دەرهاوردن** / derhawirdin/: ☜ **دەرهێنان**

**دەرهاویشتن** / derhawîştin/: چاوگ. دەراویشتن: ١. خســتنە دەرەوە ٢. *[مـەجاز]* ســەرما بــردنی ڕەپستە 📖 ١. بیرون انـداختن ٢. پژمُـردن و خشـک شدن از سرمای سخت

**دەرهاوێژان** / derhawêjan/: ☜ **دەرهاوێژران**

**دەرهاوێژران** / derhawêjran/: چاوگ. دەرهاوێژان؛ خرانە دەرەوە 📖 بیرون انداخته شدن

**دەرهــــــاوێژراو** / derhawêjraw/: ئاوەڵـــــــناو. جیاوەکریاو؛ فڕێدراو 📖 بیرون انداخته شده

**دەرهەقی** / derheqî/: ئامراز. لەحەنای 📖 در حقِ

**دەرهەڵبـوون** / derhełbûn/: چاوگ. تووڕە بوون لـە پڕێکا 📖 ناگهان برآشفتن

**دەرهەم** / derhem/: ئاوەڵناو. تێکەڵاو؛ تێـکئاڵـۆزاو 📖 مختلط؛ درهم

**دەرهـەم ـ بەرهـەم** / derhem berhem/: ئاوەڵـناو. شێواو؛ تێکەڵ‌ـپێکەڵ 📖 درهم ـ برهم

**دەرهێنـــان** / derhênan/: چـــاوگ. دەرانــــــین؛ دەرهانین؛ دەرهاوردن؛ دەرێنان؛ دەرینان ‹ڕۆحی شیرینت دەرێنــە بــۆ دەوای دەردی گــران/ ڕووکــەرە قەندیل و ئاگۆ! هەر بلـێ یـا نیشـتمان! «قـانع»› 📖 بیرون آوردن؛ درآوردن

**دەرهێنـــراو** / derhênraw/: ئاوەڵـــناو. وەرانتـــــا؛ دەرکێشراو 📖 بیرون کشیده شده

**دەرهێنەر** / derhêner/: نـاو. بەڕێوەبەری شانۆ یـان فیلم 📖 کارگردان

**دەری** / derî/: ناو. درگا 📖 درگاه

**دەریا** / derya/: ناو. ١. دەلیا؛ زەریـا؛ زریـا؛ زەلیـا؛ زرێ؛ زەری؛ زریە؛ کۆمەئاوی سوێری زۆر گــەورە کە ڕێ دەباتە سەر ئاویتر و بە دەوریدا وشکانییە ٢. *[مەجاز]* جێگایەکی زۆر گــەورە کــە زۆر شــتی لێیە ‹شاری تاران دەریایەکە لە دووکەڵ و ماشـین و مـرۆ› ٣. *[مـەجاز]* کەسـایەتی زۆر زانــا ‹هــەژاری ڕەحمەتی، دەریا بوو› 📖 ١تا٣. دریا

**دەریـابردوویی** / deryabirdûyî/: نـاو. دەریاگــەزی؛ دۆخی دڵ هەڵشێوان، ژانــەســەر و ســەرگێژە لـە سەفەری دەریاییدا کە بە هۆی تەکان و شەکانی گەمیە، تووشی بڕێ کەس دەبێ 📖 دریازدگی

**دەریـــابردە** / deryabirde/: ئاوەڵـــناو. تووشـــــی دەریابردوویی 📖 دریازده

**دەریـابڕە** / deryab(i)ře/: ناو. ماسیخۆرە؛ تۆرەمـە باڵدارێکی گەورە و دەندووک تیژن، لە مەلەوانیدا زۆر قابیلن، لاقیان بەهێز و لە پاڵ پاشەڵـیاندایە. لە مەترسیدا خێـرا دەچنــە بــن ئـاو. لـە فڕینـدا پشتیان کۆم دەکەن. زیاتر ماسـی دەخـۆن. دوو جۆریان ناسراوە: گەروو ڕەش و گــەروو ســوور 📖 مرغ غواص

**دەریاچـە** / deryaçe/: نـاو. بێــرک؛ زێ؛ زرێبــار؛ زریچـە؛ بـەهرک؛ بیرکـم؛ بـەرەم؛ بـارهۆ؛ گــۆل؛ کۆمایەک لە ئاوی سوێر یان شیرین کە ڕێ ناباتە دەریا 📖 دریاچه

**دەریاژی** / deryajî/: ☜ **دەریایی ـ٢**

**دەریاگر** / deryagir/: ناو. چەتەی ناو دەریـا 📖 دزد دریایی

**دەریاگەزی** / deryagezî/: ☜ **دەریابردوویی**

**دەریـاوان** / deryawan/: ناو. سەرلەشکەری هێـزی دەریایی 📖 دریابان

**دەریــــایی** / deryayî/: ئاوەڵـــناو. زەریــــــایی: ١. پێوەندیدار یـان سـەر بـە دەریـاوە ٢. دەریـاژی؛

خاوەن ژیان لە نێو دەریادا 🇮🇷 ١. دریایی ٢. دریازی

**دەریچە** / derîçe/: ناو. ١. دەربیچە؛ ڕۆچنەیێ کە ئامێرێکی بۆ کردنەوە و پێوەدان پێوەیە ٢. قالبی تێدا تواندنەوەی زێڕ و زیو (جارێکیتر لە کتێبە پەڕپووتێکدا ناوی دەریچە و بۆتە و گلەبۆتەمان بەرچاو هات کە بۆ سکەلێدان دەشێ و زێڕینگەر هەیانە «هەژار، چێشتی مجێور») 🇮🇷 ١. دریچە ٢. قالب ریختەگری زرگر

**دەریزان** / derîzan/: ناو. دەرازینک؛ دەرگانە 🇮🇷 ورودی؛ آستانەی در

**دەریزانک** / derîzanik/: ناو. ئاستانە؛ پێش‌درگا؛ کەوشکەن 🇮🇷 کفش‌کن

**دەریژە** / derîje/: ☜ دەربیچە

**دەرینان** / derînan/: ☜ دەرهێنان

**دەرێ** / derê/: ئاوەلکار. دەرڤە؛ دەرەوە 🇮🇷 خارج

**دەرێخستن** / derêxistin/: چاوگ. ١. دەرهێنان؛ دەرهاوردن ٢. دەرخستن؛ خویا کردن؛ ئاشکرا کردن 🇮🇷 ١. بیرون آوردن ٢. آشکار کردن

**دەرێنان** / derênan/: ☜ دەرهێنان

**دەڕ** / deř/: ناو. ١. دەز؛ مالۆس؛ مێچکە بەراز ٢. دەڵ؛ دێڵ؛ سەگی مێوینە 🇮🇷 ١. گُراز مادە ٢. مادە سگ

**دەڕابە** / deřabe/: ناو. دەڕاوە؛ دەڕڕابە؛ ئەو جۆرە دەرگایە کە هەڵدەدرێتەوە 🇮🇷 دراَبە

**دەڕاوە** / deřawe/: ☜ دەڕابە

**دەڕاوی** / deřawî/: ناو. بەلەفیرە؛ دۆخی فیڕان؛ زگچوون 🇮🇷 اسهال

**دەڕڕابە** / deřřabe/: ☜ دەڕابە

**دەڕسە** / deřse/: ئاوەلناو. دڕاو؛ دڕیاو؛ دڕیاگ؛ چڕاو 🇮🇷 دریدە؛ پارە

**دەڕکەوەچوو** / deř(i)keweçû/: ئاوەلناو. خەزریو؛ غەزریو 🇮🇷 خشمگین

**دەڕنەفیس** / deřnefîs/: ناو. جەڕبادەر؛ پێچ‌کوشتی 🇮🇷 پیچ‌گوشتی

**دەڕەماسی** / deřemasî/: ☜ دڕەماسی

**دەڕەماهی** / deřemahî/: ☜ دڕەماسی

**دەڕێگر** / deřêgir/: ناو. چەتە؛ ڕێگر 🇮🇷 راهزن

**دەز** / dez/: ناو. ١. دەڕ؛ مالۆس؛ بەرازی مێ ٢. ☜ دەست 🇮🇷 ١. گُراز مادە ٢. ☜ دەست

**دەزبڕ** / dezbiř/: ☜ دەسبڕ

**دەزبزێو** / dezb(i)zêw/: ☜ دەسبزێو

**دەزبزێوی** / dezb(i)zêwî/: ☜ دەسبزێوی

**دەزبلین** / dezb(i)lîn/: ناو. دەزبلینک؛ دەسرازە؛ منداڵ‌پێچ لە بێشکەدا 🇮🇷 بچەبندِ گهوارە

**دەزبلینک** / dezb(i)lînik/: ☜ دەزبلین

**دەزبەجێ** / dezbecê/: ☜ دەسبەجێ

**دەزبەردار** / dezberdar/: ☜ دەسبەردار

**دەزبەن** / dezben/: ☜ دەسبەند

**دەزبیران** / dezbîran/: ☜ دەزگیران

**دەزبین** / dezbîn/: ☜ دەستبێن

**دەزبینک** / dezbînik/: ناو. خشڵ و زەنبەری جومگەی دەست؛ دەستەوانەی لە زێڕ و مووروو 🇮🇷 دستبند زینتی

**دەزبێن** / dezbên/: ☜ دەسبەند

**دەزبێنک** / dezbênik/: ☜ دەسبێتك

**دەزگ** / dezig/: ☜ دەزوو

**دەزگا** / dezga/: ناو. دەسگا: ١. مەکینە (بەگشتی) ٢. کۆئەندام؛ کۆمەڵێک شت، ماک یان کەسانێ کە بە هاوگری و هاوکاری یەکەوە، بە شێوەی سەرجەم، کار یان کارگەلێکی دیاریکراو بەڕێوە دەبەن ٣. دامودەزگا؛ دەمودەزگا؛ کەل‌وپەلی تێر و تەسەل و بەشکۆی ژیان ٤. کۆشک؛ خانووبەرەی گەورە و خۆش ٥. ماڵ؛ خانوو ٦. *[کینایە]* نان و خوانی جوان و زۆر ٧. سندانی ئاسنگەر ٨. ئاسنی چەرم لە سەر کوتانی پینەچی ٩. ئەنگوستیلەی دروومان 🇮🇷 ١. ماشین (عام) ٢و٣.

دستگاه ۴. کاخ ۵. خانەی ویلایی ۶. سفرەی رنگین ۷. سندان آهنگران ۸. دستگاه پینەدوز ۹. انگشتانه

**دەزگر** / dezgir/: ناو. ۱. ☜ **دەزگیران** ۲. ☜ **دەزگیر** ۳. وردەواڵەی چەرچی ▤ ۱. ☜ **دەزگیران** ۲. ☜ **دەزگیر** ۳. کالای پیلەور

**دەزگرتی** / dezgirtî/: ☜ **دەزگیران**

**دەزگرە** / dezg(i)re/: ☜ **دەزگیر**

**دەزگەوان** / dezgewan/: ناو. وەستای مەکینە ▤ مکانیک

**دەزگهەڵکەر** / dezighełker/: ناو. خەرەک؛ کلافەکەر و کۆکەرەوەی دەزوو ▤ چرخ‌ریسمان

**دەزگیر** / dezgîr/: ناو. دەزگر؛ دەزگرە؛ دەزگیرە؛ دەزگین؛ دەستگر؛ دەسگر؛ پەڕۆی شتی داخ پێ‌گرتن ▤ دستگیره

**دەزگیران** / dezgîran/: ناو. دەزبیران؛ دەزگرتی؛ دەزویران؛ دەزووران؛ دەزیران؛ دەزیوران؛ دەزگر؛ دەسگر؛ دەسگیران؛ دەستگر؛ دەستگرتی؛ دەستگیران ▤ نامزد

**دەزگیراندار** / dezgîrandar/: ئاوەڵناو. خاوەن دەزگیران ▤ نامزدشده

**دەزگیرۆیی** / dezgîroyî/: ☜ **دەسگیرۆیی**

**دەزگیرە** / dezgîre/: ☜ **دەزگیر**

**دەزگیری** / dezgîrî/: ☜ **دەسگیرۆیی**

**دەزگین** / dezgîn/: ناو. ۱. ☜ **دەزگیر** ۲. هۆسار؛ دەسکەوسار ▤ ۱. ☜ **دەزگیر** ۲. افسار

**دەزگێڕ** / dezgêř/: ناو. فرۆشەری گەڕیدەی بێ‌دووکان ▤ دستفروش

**دەزمایە** / dezmaye/: ☜ **دەسمایە**

**دەزمایەدار** / dezmayedar/: ☜ **دەسمایەدار**

**دەزنوێژ** / dezn(i)wêj/: ☜ **دەسنوێژ**

**دەزونک** / dezunk/: ☜ **دەسینك**

**دەزویران** / dezwîran/: ☜ **دەزگیران**

**دەزوو** / dezû/: ناو. دەزگ؛ دەزی؛ تاڵی لە لۆکە ڕێسراوی زۆر باریک «ئەسپابی پێشمەرگەیی: قرۆشکەی چا، دەرزی و دەزوو و وردەبابەتم تێک نا «هەژار، چێشتی مجێور» ▤ نخ باریک

**دەزووران** / dezûran/: ☜ **دەزگیران**

**دەزووراندارى** / dezûrandarî/: ناو. سەردەمی دەزگیرانییەتی. هەروەها: **دەزوورانبازی** ▤ دوران نامزدی

**دەزوولە** / dezûle/: ناو. ۱. باریکەیەک کە وەک هەودادەزوو، لە ماکی چەسپن یان لیچقدا کاتی تکان دەبیندرێ ۲. مرۆخە؛ نوخاع؛ مۆخی بڕبڕە؛ دڕکەپەتک؛ بەشێک لە کۆئەندامی ناوەندی دەمار، کە وەک پەتێک لە نێو بڕبڕاگەدایە ▤ ۱. نخ مانندی که در مادەی چسبناک یا لزج هنگام چکیدن دیده می‌شود ۲. نُخاع

⊡ **دەزوولە کردن**: تازە بەرەو گرسان چوونی شتی تراو ▤ شروع به مُنعقد شدن مایع

**دەزی**[1] / dezî/: ناو. ۱. ☜ **دەزوو** ۲. *[کینایە]* شێوی کۆن ▤ ۱. ☜ **دەزوو** ۲. آش کهنه

**دەزی**[2]: ئاوەڵناو. کەڕواوی ▤ کفک‌زده

**دەزیران** / dezîran/: ☜ **دەزگیران**

**دەزیوران** / dezîwran/: ☜ **دەزگیران**

**دەژ**[1] / dej/: ناو. ۱. داغ؛ کاری چزاندن بە ئاسنی سووروەبوو ۲. پارێز؛ دوورەپەرێزی ▤ ۱. داغ ۲. پرهیز

**دەژ**[2]: ئاوەڵناو. دەژ و دەق؛ مۆر؛ نفت و نۆڵ؛ ئەنەخورد؛ دەکارنەکراو؛ دەستلێنەدراو ▤ دست‌نخورده

**دەژاندن** / dejandin/: چاوگ. داغ کردنی ددانی ئێشاو ▤ داغ گذاشتن بر دندان

**دەژنای** / dejnay/: چاوگ. گرژ کردن ▤ در هم کشیدن (ابرو و ...)

**دەژ و دەق** / dej û deq/: ☜ **دەژ**[2]

**دەژیای** / dejyay/: چاوگ. گرژ بوون ▤ در هم

شدن (ابرو و ...)

**دەژین** / dejîn/: ناو. ئێش؛ ژان ☰ درد

**دەس**[1] / des/: ☜ دەست

▣ **دەس بۆ دەم:** *[کینایە]* ژیـنی نەمرنـەژی؛ بـژی مەمر؛ نەقڕ نەپڕ ☰ زندگی بخور و نمیر

**دەس بە زرانی:** ☜ دەستەونەژنۆ

▣ **دەس بـان دەس نیـان:** *[کینایە]* هـیچ نـەکردن ☰ دست روی دست گذاشتن

**دەس برین:** ☜ دەست برین

**دەس بۆ بردن:** ☜ دەست بۆ بردن

**دەس بۆ هێنان:** ☜ دەست بۆ بردن

**دەس بەردان:** ☜ دەست بەردان ـ۱

**دەس بە زاخ/ زاخاوا کردن:** ☜ دەسـت بـە زاغ/ زاخا کردن

**دەس بەستن:** دەسەلات بـۆ نەهێشـتن ☰ سـلب اختیار کردن

**دەس بە سەرا گرتن:** ☜ دەست بە سەرا گرتن

**دەس پـان کردنـەوە:** *[کینایە]* دەس پـان کرنـەوە؛ پارسەکی کردن؛ سواڵ کردن ☰ گدایی کردن

**دەس پان کرنەوە:** ☜ دەس پان کردنەوە

**دەس پەرژان:** ☜ دەست پەرژان

**دەس پەرژیان:** ☜ دەست پەرژان

**دەس پیاگرتن:** ☜ دەست پیاگرتن

**دەس پێکردن:** ☜ دەست پێکردن

**دەس پێکرن:** ☜ دەست پێکردن

**دەس پێوە گرتن:** ☜ دەست پێوە گرتن

**دەس خستن:** ☜ دەست خستن

**دەس خەلیان:** دەست وەرگـەڕان ☰ رگ بـە رگ شدن دست

**دەس داگرتن:** ۱. دەس لە ژێر (شتێک)ەوە گرتن ۲. بە دەست پەستاوتن ☰ ۱. دست زیر (چیـزی) گرفتن ۲. با دست فشار دادن و چسباندن

**دەس دان:** دەست دان: ۱. هەل یان دەرفـەتێک ڕەخسـان ۲. تەوقـە کـردن؛ دەس‌وموشـتاق کردن ۳. *[مەجاز]* لوان ‹کە مـن دەس بـۆم نـەدا ڕندی، دەسا تـەقوا نەکـەم، چ بکـەم؟!/ ئەسـیری زوڵفی تاتاتم، کە واوەیلا نەکەم، چ بکەم؟ «قـانع»› ☰ ۱و۲. دست دادن ۳. ممکن شدن

**دەس دانـان:** دە گـــژڕا نەچوونـــەوە؛ دەســـت نەکردنەوە ☰ مقاومت نکردن

**دەس ڕاکرن:** ☜ دەست ڕاکردن

**دەس ڕاگرتن:** ☜ دەست ڕاگرتن

**دەس ڕۆیشتن:** ☜ دەست ڕۆیشتن/ ڕۆیین

**دەس ڕۆیین:** ☜ دەست ڕۆیشتن

**دەس قوچان:** ☜ دەست قوچان

**دەس قوچاندن:** ☜ دەست قوچان

**دەس قوچیان:** ☜ دەست قوچان

**دەس کوتان:** ☜ دەست کوتان

**دەس کەفتن:** ☜ دەست کەوتن

**دەس کەوتن:** ☜ دەست کەوتن

**دەس کێشان:** ☜ دەست کێشان

**دەس گرتن:** ☜ دەست گرتن

**دەس گوشین:** دەست لە ناو دەست نان ☰ دسـت دادن

**دەس لـە سـەر دانـان:** ۱. هەڵـبژاردن ۲. بـە زۆر داگـیر کـردن ☰ ۱. انتخـاب کـردن ۲. مُصـادره کردن

**دەس لێبەردان:** ☜ دەست لێبەردان

**دەس لێدان:** ☜ دەست لێدان

**دەس لێک بەردان:** جیا بوونەوە ☰ جدا شدن

**دەس لێهەڵگرتن:** ☜ دەست لێهەڵگرتن

**دەس ماشـان:** دەس ماشاندن؛ دەسـت قوتـان ☰ کورانە دست گرداندن

**دەس ماشاندن:** ☜ دەس ماشان

**دەس هـاوردن:** وە دەست هێنان؛ پـەیا کـردن ☰ به دست آوردن

**دەس هەڵگرتن:** ☜ **دەست بەردان**

**دەس ـ**[2]: ☜ **دەست ـ**[2]

**ـ دەس**[2]: ☜ **ـ دەست**[3]

**دەسئاخر / des'axir/:** ئاوەڵکار. ١. هیچ نەبێ؛ لانی کەم ٢. ئاخری؛ سەرەنجام ▆ ١. دستِ کم؛ لااقل ٢. سرانجام

**دەسئایر / des'ayir/:** ☜ **دەستەچیلە**

**دەسا / desa/:** ئامراز. ١. جا کە وایە ‹دەسا ئەو ڕاوکەرە کوێر بێ لە چاوان/ منی خستە قەفەس بێ سووچ و تاوان «هێمن»› ٢. دەی؛ وشەی دنە دان ‹دەساو بڕۆ! ڕامەوەستە!› ▆ ١. پس ٢. کلمەی تشجیع

**دەسار / desar/:** ☜ **دەستەهاڕە ـ١**

**دەسارت / desart/:** ناو. کاسبی بە دزی و بزدی ▆ کاسب حرامخوار

**دەساڕ / desař/:** ناو. دەستاڕ؛ دەستهاڕ؛ دەسهاڕ؛ دەسەڕ؛ دەسیەڕ؛ ئاسیاوی دەستی ▆ دستاس

**دەساژۆ**[1] **/ desajo/:** ناو. دەستاژۆ؛ دەسوفەرمان؛ لێهاتوویی لە شۆفێری ▆ مهارت رانندگی

**دەساژۆ**[2]: ئاوەڵناو. دەستاژۆ: ١. دەسەمۆ؛ ڕام؛ کەوی؛ کەدی؛ کدی ٢. ژاکاو بەهۆی زۆر دەست پێدا هێنان ▆ ١. رام ٢. دستمالی شده

**دەساگر / desagir/:** ☜ **دەستەچیلە**

**دەسامو / desamû/:** ناو. دەسبۆ؛ شەمامە؛ جۆرێ گرکەی چکۆلەی بۆنخۆشی پڕ بە دەست و خاڵ‌ـخاڵ ▆ دستنبو

**دەسان / desan/:** ناو. چیرۆک؛ حەقایەت ▆ داستان

**دەساندەس / desandes/:** ئاوەڵناو. نزیک و بەرانبەر بە یەک ▆ برابر و به هم نزدیک

**دەسانقەس / desanqes/:** ☜ **دەسانقەست**

**دەسانقەست / desanqest/:** ئاوەڵکار. دەسانقەس؛ دەسەنقەس؛ دەسەنقەست؛ دەستی؛ قەستی ▆ عمداً

**دەساو / desaw/:** ناو. دەستاو: ١. *[مەجاز]* تامی دەستی چێشت‌لێنەر ‹دایکم دەساوی خۆشە› ٢. هەویری جارێک نان کردن ‹دەساوێ هەویرمان شێلا› ٣. تەرزی بەخێو کردنی مالات ‹دەساوی چاکە، هەر ماڵێک ئەو بەخێوی کا زوو قەڵەو دەبێ› ٤. *[کینایە]* ئاودەست؛ پێشاو؛ مستەراو؛ چۆلک ٥. ئاوی ئاودێری کە بە تەنیا کەسێک نەکرێ ‹ئاوەکەی دەساوێکە دەگاتە سەر زەوی› ▆ ١. دستپُخت ٢. خمیر یکبار نان پختن ٣. طرز خوراک دادن دام ٤. مُستراح ٥. حجمی از آب که آبیاری با آن در توان یک نفر نباشد

**دەساوان / desawan/:** ناو. دەسکاونگ ▆ دستەهاون

**دەساودەس**[1] **/ desawdes/:** ناو. دەسەودەس؛ دەساودەسی؛ دەستاودەست؛ تەفرە ▆ طفره

◘ **دەساودەس کردن:** ١. چاغوبەنگ کردن؛ تەفرە دان ٢. خول پێ دان؛ گەڕاندن ٣. لە لایەک قەرز کردن و بە خاوەن‌قەرزێک دانەوە ‹تا ماڵەکە ئەفرۆشی دەساودەسێ بکە و قەرزە سووکەکانت بدەوە!› ▆ ١. این دست و آن دست کردن ٢. گرداندن ٣. از جایی قرض کردن و به طلبکاری دادن

**دەساودەس**[2]: ئاوەڵناو. دەستاودەست؛ دەسەودەس؛ لە گەڕدا ‹دنیا و داهاتی دنیا دەساودەسە، ئەمڕۆ بە تۆیە و بەیانی بە نەیاری تۆ!› ▆ در گردش؛ گردشی

**دەساودەس**[3]: ئاوەڵکار. دەستاودەست؛ دەسەودەس؛ دەسوان‌دەس ‹دەساودەس پێم‌گەیشتەوە› ▆ دست‌بەدست

**دەساودەسی / desawdesî/:** ☜ **دەساودەس**[1]

**دەساور / desawir/:** ☜ **دەستەچیلە**

**دەساوێز / desawêz/:** ناو. دەستاوێز: ١. پەلپ؛ بیانوو؛ بیانک ٢. دیاری؛ پێشکەشی؛ سەوقات ▆ ١. بهانه ٢. ارمغان

**دەساوێژ**[1] / desawêj/: ناو. دەستاوێژ: ١. پەلامار؛ هێرش؛ هەڵمەت ٢. مەودای بەرد هاویشتن ☰ ١. حمله ٢. مسافت سنگ پرت کردن

**دەساوێژ**[2]: ئاوەڵناو. دەستاوێژ؛ بە چەپۆکان (ئەسپ) ☰ ناآرام (اسب)

**دەسایر** / desayir/: ☜ **دەستەچیلە**

**دەسایز** / desayz/: ناو. دیاری؛ سەوقات؛ پێشکەشی ☰ هدیه

**دەسایزی** / desayzî/: ناو. دەستەریقانە؛ دیاری؛ دەسەدیاری ☰ سوغات

**دەسبا** / desba/: ☜ **دەسبلاو**

**دەسباد** / desbad/: ☜ **دەسبلاو**

**دەسبار** / desbar/: ☜ **دەستبار**

**دەسبازی** / desbazî/: ناو. دەستبازی؛ گەمە و گاڵتە بە دەست لە یەکتر کردن ‹کچ و کوڕ لە کونجێ خەریکی دەسبازی بوون› ☰ شوخی دستبازی

**دەسبان‌دەس** / desbandes/: ئاوەڵناو. گەورەتر؛ بەهێزتر؛ زیاتر ☰ بالادست

**دەسبرار** / desb(i)rar/: ناو. دەستەبرا؛ هەواڵی نزیک ☰ دوست صمیمی

**دەسبڕ** / desbiř/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* دەزبڕ؛ دەستبڕ؛ گزیکار؛ فریودەر؛ خاپینۆک ‹کێتب گرەوەی دەسبڕی بێ‌دین/ ڕێی ژووری نەدەی لە بۆ تێروانین «موفتی پێنجوێنی»›. هەروەها: **دەسبڕی** ☰ کُلاهبردار

**دەسبزێو** / desb(i)zêw/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دەستبزێو؛ دەزبزێو؛ بەدفەڕ؛ نائارام؛ هاروهاجی ئازاردەر ☰ ناآرام؛ شلوغ

**دەسبزێوی** / desb(i)zêwî/: ناو. *[مەجاز]* دەستبزێوی؛ دەزبزێوی؛ نائارامی؛ کاری بە هاروهاجی کردن و ئازار دان ‹تا وەکوو ساقی ئەجەل نەمداتێ تالاوی نەمان/ چاوەبرکە، دەسبزێوی، ماچی شیرینم دەوێ «هێمن»› ☰ ناآرامی

**دەسبژێر**[1] / desb(i)jêr/: ناو. دەسچن؛ دەستچین ☰ دستچین

**دەسبژێر**[2]: ئاوەڵناو. هەڵبژێردراو بە دەست ☰ دستچین

**دەسبڵاو** / desb(i)ław/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دەسبا؛ دەسباد؛ دەستبلاو؛ دەسکراوە؛ دەستبەلاف؛ دەس‌شاش؛ ماڵ‌بەفیڕۆدەر ☰ ولخرج

**دەسبۆ** / desbo/: ☜ **دەسامۆ**

**دەسبۆس** / desbos/: ☜ **دەس‌ڕامووس**

**دەسبۆسی** / desbosî/: ☜ **دەس‌ڕامووسی**

**دەسبەئاو** / desbe'aw/: قەزای حاجەت ☰ قضای حاجت

**دەسبەتاڵ** / desbetał/: ئاوەڵناو. بێکار ☰ بیکار

**دەسبەجی** / desbecî/: ☜ **دەسبەجێ**

**دەسبەجێ** / desbecê/: ئاوەڵکار. دەزبەجێ؛ دەسبەجی؛ دەستبەجێ؛ هەرلەجێ؛ دەمودەس ‹جاجمێکیان بۆ هێنام دە خۆمەوە پێچا، هەر دەسبەجێ مەنجەڵێ پلاوی هێنا، بە یەک هەڵپە خواردم! «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ فوراً

**دەسبەدەس** / desbedes/: ئاوەڵکار. دەستبەدەست: ١. نەغدبەنەغد ٢. بە ڕەواج؛ دەستاودەست لە گەڕدا ☰ ١. نقداً ٢. در گردش و رایج

**دەسبەردار** / desberdar/: ئاوەڵناو. دەستبەردار؛ دەزبەردار؛ دەس‌هەڵگر؛ وازهێن ☰ دستبردار

**دەسبەستە**[1] / desbeste/: ئاوەڵناو. دەس‌بەسە؛ دەستبەستە: ١. دەستبەستراو ٢. *[کینایە]* دەستوپێ‌سپی؛ کارلێ‌نەهاتوو ☰ ١. دست‌بسته ٢. دست‌وپاچلفتی

**دەسبەستە**[2]: ئاوەڵکار. دەس‌بەسە؛ دەستبەستە؛ قۆڵبەس؛ بە دەستی بەستراوەوە ‹گرتیان و دەس‌بەستە بردیان!› ☰ کت‌بسته

**دەس‌بەسە / desbese/**: ☜ **دەس‌بەستە**

**دەس‌بەسەر / desbeser/**: ئاوەڵناو. دەست‌بەسەر؛ لە ژێر چاوێری پۆلیس ‹سەردەمێک ئاوارە بووم و ماوەیێکیش دەس‌بەسەر/ نەمدی ڕووی ئاسوودەیی، هەر تووشی گێرە و قەرقەشم «هێمن»› ☗ تحت نظر

▣ **دەس‌بەسەر بوون**: لە ژێر چاودێریدا بوون ☗ تحت نظر بودن

**دەس‌بەسەر کران**: کەوتنە ژێر چاوەدێرییەوە ☗ تحت نظر شدن

**دەس‌بەسەر کردن**: خستنە ژێر چاوێرییەوە ☗ تحت نظر قرار دادن

**دەس‌بەسەری / desbeserî/**: ناو. دوورخراوی ☗ تبعید

**دەس‌بەسینە / desbesîne/**: ئاوەڵکار. بە دەستی لە سەر سنگەوە ☗ دست به سینه

**دەسبەن / desben/**: ☜ **دەسبەند**

**دەسبەند / desbend/**: ناو. دەزبەن؛ دەزبێن؛ دەسبەن؛ دەست‌بەند؛ دەس‌بێن: ١. کەلەپچە؛ قفڵی دەستی بەندی ٢. پێشبەندی یەکسم ٣. دەستەوانە ‹دەسبەندی زێڕ› ☗ ١. دستبند زندانی ٢. دستبند ستور ٣. دستبند

**دەس‌بەیەخە / desbeyexe/**: ئاوەڵناو ئاوقا؛ تێک‌گیراو؛ تێکهەڵچوو؛ چنگاوش ☗ گلاویز

▣ **دەس‌بەیەخە بوون**: تێکهەڵچوون؛ بە گژ یەکترا چوون ☗ گلاویز شدن

**دەس‌بێن / desbên/**: ☜ **دەسبەند**

**دەسبێنک / desbênik/**: ناو. دەزبێنک؛ مووچەوانە ☗ زیور مُچ دست

**دەسپاچە / despaçe/**: ئاوەڵناو. دەستپاچە؛ دەسەپاچە؛ هەوڵ؛ وڵنگە؛ سەرلێ‌شێواو و هەراسان لە بارودۆخ یان ڕووداوێکی لە ناکاودا ☗ دستپاچه

**دەسپاک / despak/**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* ئەمین؛ جێی متمانە ☗ امین

**دەسپاکی / despakî/**: ناو. سەرڕاستی؛ دەسپاکی؛ بێ‌گزی و دزی ☗ دُرُستکاری

**دەس‌پڕ / despiř/**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* پووڵدار؛ زەنگین؛ دەوڵەمەند ☗ ثروتمند

**دەسپەروەردە / desperwerde/**: ناو. بارهاتوو؛ ڕاهاتووی کەس یان ئاقارێک ‹ئەهای ئاویەر ئەوە من هاتم/ دەسپەروەردەکەی ئاو و هەواتم «حەقشناس»› ☗ دست‌پرورده

**دەسپەڕ / despeř/**: ناو. دەست‌پەڕ؛ دەستمیز؛ دەسمیز؛ جلق؛ مشتە؛ مشتاو ☗ جلق؛ استمنا

**دەسپیچک / despîçik/**: ناو. *[کینایە]* بیانوو؛ پەڵپ ☗ بهانه

**دەس‌پیس / despîs/**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* سیرمەخۆر؛ نائەمین ☗ دله‌دزد

**دەسپێچ / despêç/**: ناو. ١. دەسرازە؛ دەزبلین ٢. پەڕۆی لە دەست پێچانی نانکەر ☗ ١. بند گهواره ٢. مُچ‌پیچ نانوا

**دەسپێچک / despêçik/**: ناو. دەس‌پێچەنە؛ دەسەپێچک؛ دەست‌پێچک؛ دەست‌پێچەک؛ ئەو ئەندازە خوری کە تەشی‌ڕێس لە جمگەی دەهاڵێنێ ☗ مقدار پشمی که دوکریس بر مچ می‌پیچد

**دەس‌پێچەنە / despêçene/**: ☜ **دەسپێچك**

**دەسپێشخەری / despêşxerî/**: ناو. دەسپێشکەری؛ دەست‌پێشکەری: ١. کاری پێش کەس یان کەسانی‌تر وە کار کەوتن ‹من دەسپێشخەریم کرد و پارەم دا› ٢. *[سیاسی]* پێشنیاری کەسایەتی، حیزب یان تاقمێک بۆ دەرچوون لە قەیران یا گرفتێکی ڕامیاری، ئابووری یان کۆمەڵایەتی ☗ ١و٢. پیشدستی

**دەسپێشکەری / despêşkerî/**: ☜ **دەسپێشخەری**

**دەسپێک / despêk/**: ناو. سەرەتا؛ بەرژەنگ؛ کەبارە:

١. بەشی یەکەمی هەر شتێ ‹دەسپێکی کتێب› ٢. هەوەڵین قۆناغی هەر کارێ ‹دەسپێکی شەڕ› ☰ ١و٢. سرآغاز

**دەسپێکی** / despêkî/: ئامراز. سەر ☰ سرِ

**دەست**[1] / dest/: ناو. دەز؛ دەس: ١. ئەندامی بەرووی زۆرێ لە گیانداران، بەتایبەت مرۆڤ، کە لە باهۆ، ئانیشک، مەچەک و لەپ و قامکان پێکهاتووە ‹دەستی چەپ› ٢. لا؛ سۆ؛ لایەن ‹بە دەستی ڕاستدا وەرە!› ٣. یەکەی ژماردنی هەندێ شت ‹دوو دەست لیباس؛ دەستێک لیوان› ٤. سەرە؛ گە؛ جار؛ ڕا؛ کەڕەت؛ نۆرەی یاری ‹ئەم دەستە من قرەم› ٥. یەکەی بژاردنی شتی باش، هەڵکەوتە ‹دەستێ ماڵی کردۆتەوە، زۆر گەورە و خۆش› ٦. جار بۆ کار یان حاڵێ ‹دەستێکیان کوتاوە› ٧. چەشن؛ جۆر ‹لەم دەستە تۆ نان ئەکەی، هەویرمان بەش ناکا› ٨. *[مەجاز]* بەشداری ‹دەستی دژمن لەم کارەدا بووە› ☰ ١. دست ٢. سمت ٣. دست؛ واحد شمارش ۴. نوبت؛ دست در بازی ۵. دستگاه ۶. دفعە؛ بار ٧. نوع؛ شیوە ٨. دست

▣ **دەستی دوقڵد** دەستەندووی هێشە؛ دەستە مستە ☰ دستگیرەی خیش

**دەستی ڕاست:** *[کینایە]* دەستیار؛ هەمەکارە و یارمەتیدەری کەسێک ☰ دستیار اوّل

**دەستی شکاوم:** داخەکەم؛ بە داخەوە ☰ متأسفانە

**دوو دەست بە ناڵە:** *[مەجاز]* سەوداگەری بێدەسمایە ☰ بازرگان بی‌سرمایە

▣ **دەست بادان:** *[کینایە]* ١. زۆر لێ کردن؛ خستنە ژێر گوشارەوە ٢. دەس برین؛ فێڵ لێ کردن ٣. دەعیە و دەمار فرۆشتن ☰ ١. زور گفتن ٢. فریب دادن ٣. تکبر کردن

**دەست بردن:** *[کینایە]* دەست برن؛ کارێ کردن ☰ اقدام کردن

**دەست برن:** ☜ **دەست بردن**

**دەست برین:** *[کینایە]* دەز برین؛ دەس برین: ١. کڵاو سەر نان ٢. وادەی درۆ دان و چاوەڕوان کردن ☰ ١. کلاهبرداری کردن ٢. سر کار گذاشتن

**دەست بزاوتن:** *[کینایە]* دەز بزاوتن: ١. دەسدرێژی کردن ٢. دەس جووڵاندن؛ توند کار کردن ☰ ١. دست‌اندازی کردن ٢. سریع کار کردن

**دەست بزواندن:** *[کینایە]* دەس جووڵاندن؛ جووڵە کردن ‹دیار بوو ئیحتیاتی گەورە لە دەوری پادگان کرابوو کە هەر دەست ببزێون تێیان سرەوێنن «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ جم خوردن

**دەست بلند کردن:** *[کینایە]* دەست کردنەوە؛ بە گژ دوژمنا چوون ☰ در برابر دشمن ایستادن

**دەست بۆ بردن:** دەس بۆ بردن؛ دەس/ دەست بۆ هێنان: ١. *[کینایە]* دەست لە قوون دانی کەسێ ٢. دەست بۆ خۆراک درێژ کردن ☰ ١. انگُلک کردن ٢. دست بە خوراک بردن

**دەست بۆ هێنان:** ☜ **دەست بۆ بردن**

**دەست بوون:** *[کینایە]* ١. دەست ڕۆیشتن ٢. بەشدار بوون لە کارێکدا ☰ ١. استطاعت مالی داشتن ٢. دست داشتن (در کاری)

**دەست بە ناو گەیاندن:** *[کینایە]* چوونە سەر دەساو ☰ مُستراح رفتن

**دەست بە دەم گەیشتن:** *[کینایە]* کاسبی خراپ نەبوون و خەرجی خۆ پەیدا کردن ☰ دست بە دهن رسیدن

**دەست بەردان:** دەس بەردان: ١. واز هێنان؛ دەس‌هەڵگرتن ٢. جودا بوونەوە؛ دوور بوونەوە ☰ ١. دست برداشتن ٢. دوری گزیدن

**دەست بە ڕوووە نان:** *[مەجاز]* مەیۆس کردن؛ ناهومێد کردن ☰ نومید گردانیدن

**دەست بە زاغ/ زاخا کردن:** *[کینایە]* دەس بە زاخ/ زاخاوا کردن؛ دەست بە زاخاوا کردن؛ فریو دان

و زیان پێ گەیاندن ‹نەمزانی فەلەک گۆبەنی هەر بۆ منە یا خۆ/ سەد دەستی وەکوو دەستی منی کردووە بە زاغا «شێخ ڕەزا»› 🇮🇷 فریب دادن و آسیب رساندن

**دەست بە زاخاوا کردن:** ☜ **دەست بە زاغ/ زاخا کردن**

**دەست بە زەرد بوون:** *[کینایە]* دەست بۆ هەر کارێک بردن، خراپ کردن 🇮🇷 هر کاری کردن، خُسران به بار آوردن

**دەست بە سەرا گرتن:** *[کینایە]* دەس بە سەرا گرتن؛ دەست بە سەردا گرتن؛ بە زۆر کردنە هی خۆ؛ داگیر کردن 🇮🇷 غصب کردن

**دەست بە سەردا گرتن:** ☜ **دەست بە سەرا گرتن**

**دەست بە قەڵەم بوون:** لێهاتوو بوون لە نووسیندا؛ نووسەری باش بوون 🇮🇷 دست به قلم بودن

**دەست بە کار بوون:** دەسپێکردنی کار 🇮🇷 دست به کار شدن

**دەست بە کارێ کردنەوە:** کارێ لەسەرڕا دەسپێکردن ‹دەستمان کردەوە بە خواردن› 🇮🇷 اقدام دوباره به کاری کردن

**دەست بە کارێکەوە دان:** کارێ کردن ‹دەست بدەرە کارێ، بکوژە مارێ! «مەسەل»› 🇮🇷 اقدام کردن

**دەست پاراستن:** ۱. ئاگاداری جوولە و تەکانی دەست بوون ۲. *[کینایە]* بە تەگبیرەوە کار کردن 🇮🇷 ۱. مواظب بودن ۲. دست به عصا رفتن

**دەست پان کردنەوە:** *[کینایە]* دەست درێژ کردنەوە؛ سواڵ کردن 🇮🇷 دست دراز کردن

**دەست پەرژان:** *[کینایە]* دەس پەرژان؛ دەس پەرژیان؛ دەرفەت پەیدا کردن؛ پێ کران 🇮🇷 مجال یافتن

**دەست پیاگرتن:** دەس پیاگرتن: ۱. *[کینایە]* ماڵداری کردن لە ئازووقەدا ۲. *[مەجاز]* داگیر کردن 🇮🇷 ۱. صرفەجویی کردن ۲. اشغال کردن

**دەست پێداهێنان:** ۱. بە دەست ماڵین ۲. دەست پێدا ساوین ‹دەستی پێدا بێنە، بزانە چ زبرە!› ۳. *[کینایە]* تەواو ڕاماشتن 🇮🇷 ۱. مالیدن ۲. دست بر چیزی کشیدن ۳. جارو کردن

**دەست پێش خستن:** *[کینایە]* پێشدەستی کردن؛ دەست خستنە بەر ‹ئەو دەستی پێش خست و داوای لێبووردنی کرد› 🇮🇷 دست پیش را گرفتن

**دەست پێکردن:** *[کینایە]* دەس پێ کردن؛ دەس پێ کرن؛ سەرەتا دامەزراندن؛ سەرپێک خۆش کردن 🇮🇷 شروع کردن

**دەست پێوە گرتن:** *[کینایە]* دەس پێوە گرتن؛ ئاگاداری کردن لە ماڵ و ڕزق ‹دەستی پێوە بگرە با بەش کا› 🇮🇷 صرفەجویی کردن

**دەست پێوەنان:** *[کینایە]* دەرکردن؛ لە کۆڵ خۆ کردنەوە 🇮🇷 دک کردن

**دەست تێبردن:** ۱. دەست خستنە ناو شتێ ۲. *[کینایە]* گۆڕین و شێواندن ۳. *[کینایە]* دەست تێوەردان 🇮🇷 ۱. دست بُردن در چیزی ۲. تحریف کردن ۳. دخالت کردن

**دەست تێخستن:** ۱. دەست خستنە ناو شتێ ۲. *[کینایە]* دەست تێوەردان 🇮🇷 ۱. دست بُردن در چیزی ۲. دخالت کردن

**دەست تێدا هەبوون:** *[کینایە]* بەشدار بوون (زۆرتر بۆ خراپە) ‹ئەویش دەستی تێدا هەبوو، بۆیە هەڵات› 🇮🇷 دست داشتن

**دەست تێوەردان:** *[کینایە]* ۱. خەریک بوون ۲. دەست تێ بردن 🇮🇷 ۱. مشغول شدن/ بودن ۲. دخالت کردن

**دەست چەور کردن:** *[کینایە]* بەرتیل دان 🇮🇷 رشوه دادن

**دەست خستن:** *[کینایە]* دەس خستن؛ بە دەست هێنان؛ گیر هێنان؛ بە گیر هێنان 🇮🇷 گیر آوردن

**دەست داکێشان:** */کینایە/* ۱. دەسدرێژی کـردن ۲. دەست درێژ کردنەوە؛ سواڵ کردن ⇐ ۱. تعدی کردن ۲. گدایی کردن

**دەست دان:** دەس دان: ۱. تەوقــە کـــردن ۲. */مەجاز/* لوان ⇐ ۱. دست دادن ۲. ممکن شدن

**دەست ڕاکردن:** */کینایە/* دەس ڕاکـــرن؛ دەس کردنەوە؛ بـە گـژ دوژمنـا چـوون ⇐ ایستادگی کردن (در جنگ)

**دەست ڕاکێشان:** دەست درێژ کردنەوە ‹کوردێـک هـات جگـە لـە دەسـت ڕاکێشـان چـۆکی دادا و سوێندی خوارد ... «هەژار، چێشتی مجێـور»› ⇐ دست دراز کردن

**دەست ڕاگرتن:** */کینایە/* دەس ڕاگـرتن؛ سـەبر کردن؛ لێ ڕاوەستان؛ بـەس کـردن لـە کـار ⇐ دست نگهداشتن؛ متوقف کردن کار

**دەست ڕاوەشاندن:** دەس تەکان دان؛ حەرەکـەت دان بە دەست بە مەبەستی سڵاو یان حـاڵاتی دیکە ⇐ دست تکان دادن

**دەست ڕۆیشتن/ ڕۆیین:** */مـەجاز/* دەس ڕۆیـــین/ ڕۆیشــتن؛ دەس چـوون؛ دەسـەڵات هـەبوون ‹دەستم کە بڕۆیشتبا خودائاسایی/ گـەردوونێ تـرم دەخســتە ڕوو ســانایی «هــەژار، *چوارینــەکانی خەییام*»› ⇐ قدرت داشتن

**دەست ڕەقاس بون:** */کینایە/* ڕاهاتنی دەست لە کار ‹دەستم ڕەقاس بـووە، زوو جێبـەجێ دەکـەم› ⇐ ماهر شدن در کار

**دەست زۆر بون:** */کینایە/* لە پیشەیەکدا ڕکابەر زۆر بوون ⇐ دست زیاد بودن

**دەست زێ هلانین:** */کینایە/* واز لێ هێنـان ⇐ دسـت بردار شدن

**دەست سپی کردن:** */کینایە/* پارە دان ⇐ پول دادن

**دەست شل/ سارد بونەوە:** */کینایـە/* ناهومێـد و دڵسارد بوون لە کار ⇐ ناامید شدن

**دەست قراندن:** باسک بادان ⇐ دست پیچاندن

**دەست قوتان:** ☜ دەست کوتان

**دەست قوچاندن:** */کینایە/* دەس قووچـان؛ دەس قووچاندن؛ دەس قووچان؛ هـیچ نـەدان (زیـاتر پووڵ و پارە) ⇐ نم پس ندادن

**دەست قوچانن:** ☜ دەست قوچاندن

**دەست کردنە کاری:** لـە سـەرەتاوە بـە کارێکـەوە خەریک بوون ⇐ کاری را شروع کردن

**دەست کردنەوە:** */مەجاز/* تەقە کردن؛ تیر هاویشتن (لە دوژمن) ⇐ تیراندازی کردن

**دەست کوتان:** دەس کوتان؛ دەسـت قوتـان؛ بـە کوێرە-کوێر بۆ شت گەڕان ⇐ کورمال - کورمال با دست جستجو کردن

**دەست کەوتن:** دەس کـەفتن؛ دەس کـەوتن؛ کەوتنە دەست؛ گیر هاتن ⇐ بـە دسـت آمـدن؛ گیر آمدن

**دەست کێشان:** دەس کێشان: ۱. چاوساغی کردن ۲. */کینایە/* دەست لـە کـار بـەردان ⇐ ۱. عصـا کشیدن (نابینا) ۲. دست از کار کشیدن

**دەست کێشانەوە:** */کینایە/* لـە کارێـک دەسـت هەڵگرتن ‹دەستی لـە دزی و فـزی کێشـاوە› ⇐ دست از کاری کشیدن

**دەست گرتن:** */کینایە/* دەس گرتن: ۱. یاریـدە دان ‹دەستی هەژارانی دەگرت› ۲. نیشان کردن بـۆ دەزگیران ‹دەستی کچی کوێخای گرتووە› ⇐ ۱. کمک کردن ۲. نامزد کردن

**دەست گەیاندنە ئاو:** */کینایە/* چوونە سەر ئاودەست ⇐ دست بە آب رساندن

**دەست گەیشتن:** ۱. لە بەر دەستدا بوون ۲. */کینایە/* دەس گەیین؛ دەرفەت هەبوون ‹دەستت دەگـا بۆمی بنووسی؟› ⇐ ۱. در دسترس بودن ۲. فُرصت داشتن

**دەست گێڕانەوە:** */کینایە/* لە خەرج کـەم کردنـەوە

‹ئەوەی فێری دەست گێڕانەوە نەبێ، قەت نابێ بە ماڵ› ☰ صرفەجویی کردن

**دەست لە پشت دان:** *[کینایە]* دنە دان؛ هانە دان ☰ تشجیع کردن

**دەست لە دڵ نەبونەوە** *[کینایە]* دڵ نەهاتن ☰ دل نکندن (از مال دنیا)

**دەست لە ڕوو نان:** *[کینایە]* داخوازی کەسێ بەجێ نەهێنان ☰ روی کسی را زمین زدن

**دەست لە ڕەش و سپی نەدان:** *[کینایە]* هیچ نەکردن؛ خۆ لە کار نەدان ☰ دست به سیاه و سفید نزدن

**دەست لە سەر دانان:** *[مەجاز]* ١. هەڵبژاردن ٢. بە زۆر داگیر کردن ☰ ١. انتخاب کردن ٢. غصب کردن

**دەست لە سەر دەست دانان:** *[کینایە]* هیچ نەکردن لە کاتێدا دەبێ کارێ بکرێ ☰ دست روی دست گذاشتن

**دەست لە شتێک بەردان:** ☜ **دەست لە (سەر) شتێك هەڵگرتن**

**دەست لە شتێک کێشان(ەوە):** ☜ **دەست لە (سەر) شتێك هەڵگرتن**

**دەست لە (سەر) شتێک هەڵگرتن:** *[کینایە]* دەست لە شتێک بەردان؛ دەست لە شتێک کێشان(ەوە)؛ وێڵ کردن؛ واز لە شتێک هێنان ☰ دست برداشتن

**دەست لە گۆزە دامان:** *[مەجاز]* هیوا نەمان ☰ ناامید شدن

**دەست لە گیان بەردان:** ☜ **دەست لە گیان داشۆردن**

**دەست لە گیان داشۆردن:** *[مەجاز]* دەست لە گیان بەردان؛ ئامادەی مەرگ بوون ‹من هیچم نەماوە، دەستم لە گیان داشۆردووە› ☰ دست از جان شستن

**دەست لە نێو دەستی یەک نان:** ١. دەست و مشتاخ کردن ٢. *[کینایە]* مارە برینی کچ و کوڕ لە یەک ‹نەمرم دەستتان دەنێمە نێو دەستی یەک› ☰ ١. دست دادن ٢. به عقد هم در آوردن دختر و پسر

**دەست لە هەمانە بەر بون:** *[مەجاز]* ناهمێد بوون ☰ ناامید شدن

**دەست لێ بەردان:** *[کینایە]* دەس لێبەردان؛ واز لێ هێنان ☰ دست برداشتن

**دەست لێ داشتن:** *[مەجاز]* هیوا پێ نەمان؛ چاوەڕوان نەبوون ☰ هیچ امید و انتظاری نداشتن

**دەست لێدان:** دەس لێدان: ١. دەست پێدا کێشان ‹دەستی لێدە بزانە چ فەرشێکە› ٢. دەسکاری کردن ☰ ١. دست مالیدن؛ دست زدن (به چیزی) ٢. دستکاری کردن

**دەست لێ ڕاگرتن:** *[کینایە]* لە سەر ڕاوەستان ☰ مُهلت دادن

**دەست لێ ساندن:** *[کینایە]* بەزاندن ‹بە جارێ دەستی لێ ساندووە› ☰ شکست دادن

**دەست لێ نان:** نەبز گرتن ☰ نبض گرفتن

**دەست لێ وەرنان:** *[کینایە]* باوەش پێدا کردن ‹وەرە کولمەم لە کولمەی تۆ خشێنم/ وەرە با دەست لە بالاکەت وەرێنم «هێمن»› ☰ در آغوش گرفتن

**دەست لێ وەشاندن:** دەست وەشاندن: ١. بە چالاکی لێ دان یا بردن ٢. *[باوەڕی کۆن]* شێت بوونی مرۆ بە دەست جنۆکە ☰ ١. ضربه زدن یا بردن چیزی به چالاکی ٢. دیوانه شدن به وسیلەی جن

**دەست لێهەڵگرتن:** *[کینایە]* دەس لێهەڵگرتن؛ واز لێ هێنان ☰ دست بردار شدن

**دەست لێ هەڵێنان:** ١. *[کینایە]* پەلە کردن لە کار ‹ئەگەر دەستی لێ هەڵێنن بۆ ئێوارە تەواو دەبێ› ٢. دەست هەڵێنان بۆ لێ دان ☰ ١. عجلە

کردن در کار ٢. دست روی کسی بلند کردن

**دەست و باڵ بەستن:** ١. دەس و پێ بەستن؛ لە جەوجووڵ خستن ٢. [مەجاز] ڕێگە پێ نەدان ⚑ ١. کت بستن ٢. اجازه ندادن

**دەست و دڵ یەک نەگرتن:** [مەجاز] دەس و دڵ یەکانگیر نەبوون؛ هێز و هیوای کار کردن نەمان ⚑ دست و دل به کار نرفتن

**دەست و دەم پێوە خوران:** [مەجاز] زۆر بە تام و چێژ بوون ‹چێشتێکی کردبوو دەست و دەمی پێوە دەخورا› ⚑ بسیار لذیذ بودن

**دەست وەشاندن:** ١. ☜ **دەست لێ وەشاندن** ٢. [کینایە] کارێکی گرینگ و پڕبایەخ کردن ‹بە کرینی ئەو ماڵە دەستی خۆتت وەشاند› ⚑ ١. ☜ **دەست لێوەشاندن** ٢. کارِ کارستان کردن

**دەست هەڵانین:** دەست ڕاکرن؛ بە گژ دوژمنا چوون ⚑ بر دشمن شوریدن

**دەست هەڵگرتن:** [کینایە] ١. واز هێنان ٢. داخستن؛ کۆتایی پێ هێنان ⚑ ١. دست برداشتن ٢. تعطیل کردن

**دەستی تەڕ لە دوو دان:** [مەجاز] فریو دان و بێئەنجام بەڕێ کردن ⚑ فریب دادن و رد کردن

**دەستی کەسێک سووک بوون:** [مەجاز] ١. زەرب و ئازار دەستی کەسێک کەم بوون ٢. داودەرمانی کەسێک (پزیشک) زۆر کاریگەر بوون ٣. زۆر خێرا کار کردن ⚑ ١تا٣. دست کسی سبک بودن

**دەستێک تێدا هەبوون:** [کینایە] جگە لە کاری سەرەکی خاوەنی لێهاتوویی بوون لە کارێکی تردا ‹لە شیعریشدا دەستێکی هەیە› ⚑ دستی در کاری داشتن

**بە دەست هێنان:** ☜ **دەست خستن**

**لە دەست هاتن:** [کینایە] بۆ لوان؛ بووز خواردن ⚑ از عهده برآمدن

**گرتنە دەست:** [کینایە] وە ژێر دەسەڵات خستن ⚑ به دست گرفتن

**لە دەست دەرچوون:** ١. هەڵاتن ‹لە دەست پۆلیس دەرچوو› ٢. [مەجاز] کوتوپڕ کارێک لێ بوونەوە ‹نەمزانی، لە دەستم دەرچوو› ٣. [کینایە] لە کیس چوون ‹ئەو هەلەم لە دەست دەرچوو› ⚑ ١. دررفتن ٢. از دست دررفتن ٣. هدر رفتن

**لە دەست دەرهێنان:** [کینایە] بە زۆر و گزیکاری لە چنگ کەسێک کردنەوە ⚑ از دست کسی درآوردن

**دەست ـ**[2]: پێشوشە. دەس ـ ‹دەستڕۆیشتوو؛دەستبڵاو› ⚑ دست ـ

**ـ دەست**[3]: پاشوشە. ـ دەس ‹کاربەدەست› ⚑ ـ دست

**دەستئیفلیج** / dest'îflîc/: ☜ **دەستقوپ**

**دەستاخ** / destax/: ☜ **دەرساخ**

**دەستاڕ** / destař/: ☜ **دەساڕ**

**دەستاڕگێڕ** / destařgêř/: ناو. لێکەر؛ ئاشێڕ ⚑ دستاس‌گردان

**دەستاژۆ** / destajo/: ☜ **دەساژۆ**

**دەستاق** / destaq/: ☜ **دەرساخ**

**دەستان** / destan/: ناو. چیرۆک ⚑ داستان

**دەستاندە** / destande/: ناو. سەدەقە؛ ساقە؛ خێر؛ ماڵێ کە لە ڕێگەی خودا بە هەژاران دەدرێ ⚑ صدقه؛ خیرات

**دەستاو** / destaw/: ☜ **دەساو**

**دەستاودەست** / destawdest/: ☜ **دەساودەس**

**دەستاونگ** / destawing/: ☜ **دەسکاونگ**

**دەستاوەنگ** / destaweng/: ☜ **دەسکاونگ**

**دەستاوێز** / destawêz/: ☜ **دەساوێز**

**دەستاوێژ** / destawêj/: ☜ **دەساوێژ**

**دەستبار** / destbar/: ناو. دەسبار؛ کاری بار هەڵگرتن بە دوو کەس ‹شەنگەبێری یار و دەستباری کوڕی کۆچەر نەبێ/ چۆن دەگاتە جێ

هەوار و هۆبە، ئەو بارگە و بنــە؟ «هــێمن»› 🇮🇷 عمـل برداشتن بار توسط دو نفر

**دەستبازی** / destbazî/: ☜ دەسبازی

**دەستبدەست** / destb(i)dest/: ئاوەڵناو. بەرانبەر (لـە کایەدا) 🇮🇷 مساوی (در بازی)

**دەستبڕ** / destbiř/: ☜ دەسبڕ

**دەستبزێو** / destb(i)zêw/: ☜ دەسبزێو

**دەستبزێوی** / destb(i)zêwî/: ☜ دەسبزێوی

**دەستبشـــۆڵ** / destb(i)şol/: ئاوەڵـــــناو. [پـــلار] لاپرەسەن؛ خۆتێهەڵقوڵتێن 🇮🇷 فضول

**دەستبڵاو** / destb(i)ław/: ☜ دەسبڵاو

**دەستبوها** / destbuha/: ناو. مزی دەلاڵـی 🇮🇷 مـزد دلالی

**دەستبووری** / destbûrî/: ئاوەڵناو. [پلار] قسەزلی بـێ کردەوە؛ دەمهەراشی بێکارە 🇮🇷 پرحرف بیکاره

**دەستبەئەژنۆ** / destbe'ejno/: ☜ دەستەونەژنۆ

**دەستبەتاڵ** / destbetał/: ئاوەڵناو. ١. دەســتواڵا؛ دەستتەنگ ٢. بێکار 🇮🇷 ١. تنگدست ٢. بیکار

**دەستبەجێ** / destbecê/: ☜ دەسبەجێ

**دەستبەدەست** / destbedest/: ☜ دەسبەدەس

**دەستبەردار** / destberdar/: ☜ دەسبەردار

**دەســـتبەردایی** / destberdayî/: ئاوەڵـــــناو. ١. دەستهەڵگرتوو ٢. دەســبڵاو 🇮🇷 ١. بازایستاده ٢. ولخرج

**دەستبەســــــــتراو** / destbest(i)raw/: ☜ دەسبەستە[1]ـ١

**دەستبەستە** / destbeste/: ☜ دەسبەستە

**دەستبەسەر** / destbeser/: ☜ دەسبەسەر

**دەستبەسەری** / destbeserî/: ☜ دەسبەسەری

**دەستبەســینە** / destbesîne/: ئاوەڵـــناو. [کینایــە] دەسوەســینە؛ دەســتەونەزەر؛ دەســتقــیلک؛ ملکەچ و گوێڕایەڵی فەرمان 🇮🇷 دستبەسینە؛ مُطیع

**دەستبەقرپ** / destbeqirp/: ئاوەڵـناو. دەســباد 🇮🇷 ولخرج

**دەستبەلاڤ** / destbelav/: ☜ دەسبلاو

**دەستبەند** / destbend/: ☜ دەسبەند

**دەستبێن** / destbên/: ناو. دەزبین؛ ڕیسمانێک کـە شوان شەوانە دەیکاتە مـل یـان لاقـی شـەکێکی سرک و سەرێکی دەبەستێتە باسکی خۆیـەوە بـۆ ئاگـاداری لـە مەترسـی یـان ڕادانی ڕانەمــەڕ 🇮🇷 ریسمان شبان

**دەستپاچە** / destpaçe/: ☜ دەستەپاچە

**دەســــــــتپەروەردە** / destperwerde/: ☜ دەسپەروەردە

**دەستپەڕ** / destpeř/: ☜ دەسپەڕ

**دەستپیس** / destpîs/: ئاوەڵـناو. دزی خوێڕیلــە 🇮🇷 دلەدُزد

**دەستپیسی** / destpîsî/: ناو. نائەمینی 🇮🇷 دلەدُزدی

**دەستپێچک** / destpêçik/: ☜ دەسپێچك

**دەستپێچەک** / destpêçek/: ☜ دەسپێچك

**دەستپێشکەری** / destpêşkerî/: ☜ دەسپێشخەری

**دەستتەنک** / desttenik/: ☜ دەستتەنگ

**دەستتەنکی** / desttenikî/: ☜ دەستتەنگی

**دەســـتتەنگ** / destteng/: ئاوەڵـــــناو. [مـــــجاز] دەستتەنک؛ کەمدەست؛ نەدار 🇮🇷 تنگدست

**دەســـتتەنگی** / desttengî/: نــــــاو. [مــــجاز] دەستتەنکی؛ کەمدەستی؛ نەداری 🇮🇷 تنگدستی

**دەستتێر** / desttêr/: ئاوەڵـناو. [مـجاز] دەســتێر؛ دەوڵەمەند 🇮🇷 ثروتمند

**دەستچن** / destçin/: ئاوەڵـناو. دەسچن؛ دەسـچین: ١. بە دەست تەنراو ٢. بە دەست هەڵکەنراو 🇮🇷 ١. دستباف ٢. دستچین

**دەستچین** / destçîn/: ناو. دەسبژێر 🇮🇷 دستچین

**دەستچێن** / destçên/: ئاوەڵـناو. بە دەست کێڵراو 🇮🇷 کاشته شده

**دەستحیز** / desthîz/: ئاوەڵناو. [مجاز] دز 🇮🇷 دُزد

**دەستخاف** / destxav/: ☜ **دەستخاو**

**دەستخاو** / destxaw/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دەستخاف؛ خاوەخاوکەر؛ سست لە کار ☰ کُندکار

**دەستخڕۆ** / destx(i)řo/: ☜ **دەستخەڕۆ**

**دەستخورێن** / destxurên/: ناو. گەزنە؛ ئاڵۆشە ☰ گزنه

**دەستخۆش** / destxoş/: سارستە. مـالاوا؛ ئافـەرین (زۆرتر بۆ تەشەر لێدان دەگوترێ) ‹کاکە دەستخۆش، ئەمە بوو برایەتی؟› ☰ دستخوش

**دەستخۆشانە** / destxoşane/: ناو. ١. ئەو پارەی کە بەرەندەی قومار دەیبەخشێ ٢. خەڵات؛ پاداشـی کاری جوان ٣. هبوودی؛ ئەو پارەیە، زیاد لە مـز، بە وەستا یان شـاگرد دەدرێ ☰ ١. دستخوش در قمار ٢. جایزه ٣. انعام استاد یا شاگرد

**دەستخۆشی** / destxoşî/: ناو. دەسخۆشی؛ سپاس و پێزانین. هەروەها: **دەستخۆشی کردن** ☰ تشکر

**دەستخەت** / destxet/: ناو. بـە دەسـت نووسـراو ☰ دستخط

**دەستخەڕۆ** / destxeřo/: ئاوەڵـناو. دەسـتخڕۆ؛ دەسـخڕۆ؛ دەسـخەڕۆ: ١. فریـودراو ‹هەنـدێ دەستخەڕۆ دووی غـروور کـەوتن/ هەنـدێک شـوێن کۆشکی پڕ لە حوور کەوتن «گۆران»› ٢. دەستەمۆ؛ دەسەمۆ ☰ ١. فریبخورده ٢. رام

**دەستدا** / destda/: ئاوەڵناو. ژێرچەپۆکە ☰ زیردست

**دەستدروو** / destd(i)rû/: ئاوەڵناو. بە دەسـت دووراو ☰ دستدوز

**دەستدرێژ** / destd(i)rêjî/: ☜ **دەسدرێژ**

**دەستدرێژکەر** / destd(i)rêjker/: ئاوەڵـناو. *[مـەجاز]* هەڵەمارکەر؛ پەلاماردەر؛ زاڵم ☰ تجاوزگر

**دەستدرێژی** / destd(i)rêjî/: ☜ **دەسدرێژی**

**دەستڕاست** / destřast/: ئاوەڵـناو. *[کینایـە]* نیشانئەنگێو؛ لە ئامانجدەر ☰ ماهر در تیراندازی

**دەستڕژد** / destřijd/: ئاوەڵـناو. *[مـەجاز]* ئـاجگی؛ چکووس ☰ خسیس

**دەستڕۆشتوو** / destřoştû/: ئاوەڵـناو. *[مـەجاز]* بـە دەسەڵات ☰ توانا

**دەستڕەس** / destřes/: نـاو. ١. ڕادەس؛ دەردەس؛ دەردەست؛ بەردەست؛ بەردەس؛ لادەس؛ ئـەوێ یا ئەوەی بە سانایی دەستی پـێ ڕابگـا ٢. کـار و ڕەوتی دەست پێڕاگەیشتن دەست پێ‌گەیشـتن ‹وەڵلاهی کلاوی سەری من چەرخی دەمالی/ ببوایە بـە دامانـت ئەگـەر دەستڕەسـێکم «نـالی»› ☰ ١. دسترس ٢. دسترسی

**دەستڕەش** / destřeş/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* تایبەتمەندی کەسێ کە خێرێکی لێ نابێتەوە ☰ بی‌خیر

**دەستڕەنگینی** / destřengînî/: نـاو. *[کینایـە]* شیرنکاری ☰ شیرینکاری

**دەستڕەوانی** / destřewanî/: نـاو. *[مـەجاز]* دەست‌گەرمی؛ دۆخی ورده ـ ورده دەسـپێکردن بۆ پێڕاهاتن و تەیار بوون لە کارێکدا ☰ دست‌گرمی

**دەستڕێژ** / destřêj/: ☜ **دەسڕێژ**

**دەستسارد** / destsard/: ☜ **دەستسپی**

**دەستساز** / destsaz/: ☜ **دەسکرد ـ١**

**دەستسپی** / dests(i)pî/: ئاوەڵـناو. *[مـەجاز]* دەستسارد؛ فێرەکارنەبوو ☰ نیازموده

**دەستسڕ** / destsiř/: ☜ **دەسەسڕ**

**دەستسڤک** / dests(i)vik/: ☜ **دەستسووك**

**دەستسووک** / destsûk/: ئاوەڵـناو. *[مـەجاز]* دەسـتسڤـک؛ دەسسڤـک؛ دەسسـووک؛ سووک‌دەس؛ سـووک‌دەسـت: ١. تایبەتمەنـدی بژیشـکێ کـە نـەخۆش زوو چـاک دەکاتـەوە ٢. تایبەتمەنـدی کەسـێ کـە زەبـری دەسـتی زۆر نەیەشێ ٣. تایبەتمەندی کەسـێ کـە حـەیوانی سەربڕاوی زوو لە بـەر دەسـت خەلاسـی دێ ٤. تایبەتمەندی کەسێ کە دەست بە هەر کارێ بکا زوو تـەواو بـێ ٥. گیرفـانبـڕی کارامـە ☰ ١.

سبکدست (پزشک) ٢. دست‌سبک (کسی که ضربه‌ی او چندان دردآور نباشد) ٣. سبکدست (کسی که اگر حیوانی را سر ببرد زود جان دهد) ۴. سریع در کار ۵. جیب‌بُر ماهر

**دەستشاش** / destşaş/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دەسباد؛ هەڵەخەرج ☯ ولخرج

**دەستشڕ** / destşiř/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دەسبلاو ☯ ولخرج

**دەستشۆ** / destşo/: ☜ **دەستشۆر**

**دەستشۆر** / destşor/: ناو. دەستشۆ؛ دەستشۆیی؛ دەستشۆرک؛ دەسشۆری؛ جێگەی دەست لێ‌شوتن ☯ دستشویی

**دەستشۆرک** / destşorik/: ☜ **دەستشۆر**

**دەستشۆیی** / destşoyî/: ☜ **دەستشۆر**

**دەستشێل** / destşêl/: ئاوەڵناو. بە دەست شێلدراو و ڕاهاتە ☯ چلانده و آماده

**دەستفرۆش** / destf(i)roş/: ناو. دەسفرۆش؛ ماملەچی سەرپایی ☯ دستفروش

**دەستڤالا** / destvala/: ئاوەڵناو. دەستڤاله: ١. دەستەنگ ٢. بێکار؛ دەستبەتاڵ ☯ ١. تنگدست ٢. بیکار

**دەستڤالە** / destvale/: ☜ **دەستڤالا**

**دەستڤانک** / destvanik/: ناو. گیایەکە ☯ گیاهی است

**دەستڤەکری** / destvek(i)rî/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* دەستکراوە؛ دەهندە؛ دلاوا ☯ سخی

**دەستڤیلک** / destvîlik/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **دەستبەسینە** ٢. *[مەجاز]* نەرم و نیان و بێ‌وەی ☯ ١. ☜ **دەستبەسینە** ٢. رام و بی‌آزار

**دەستقرمتی** / destq(i)řimtî/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ڕژد و چرووک ☯ خسیس

**دەستقلپ** / destqiłp/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* کۆڵەزەرەر؛ ماڵ بە فیڕۆدەر ☯ مال هَدَر دِه

**دەستقوپ** / destqup/: ئاوەڵناو. دەستئیفلیج؛ بە دەستی فەلەجەوە ☯ فلج از ناحیه‌ی دست

**دەستقورس** / destqurs/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* دەسقورس؛ بە زەبر لە لێدانەدا. بەرانبەر: **دەستسووک** ☯ دارای قدرت دست زیاد

**دەستقوچاو** / destqûçaw/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* دەسقووچاو؛ دەسقووچیاگ؛ دەسقووچیاو؛ چکووس؛ ڕژد ☯ خسیس

**دەستقەرز** / destqerz/: ناو. دەسقەرز؛ دەستەواو ☯ قرض دستی

**دەستک** / destik/: ناو. ١. جێ دەستی تیخ ٢. دەسکە گوڵ ٣. هەنگڵ؛ دەسکەی گۆزە و ... ٤. دەستە؛ کۆمەڵ ☯ ١. دسته‌ی تیغ ٢. دسته‌گل ٣. دستگیره ۴. دسته؛ گروه

**دەستکاتی** / destkatî/: ئاوەڵناو. ١. دز؛ ماڵبڕ ٢. جاسووس؛ شوفار ☯ ١. دزد ٢. جاسوس

**دەستکار** / destkar/: ☜ **دەسکرد**

**دەستکاری** / destkarî/: ناو. دەسکاری: ١. ڕەوتی بە دەست کار تێدا کردن ٢. کاری گۆڕینی باری شت (زیاتر تێکدان) ☯ ١. کار با دست ٢. دستکاری

**دەستکراوە** / destk(i)rawe/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دەستڤەکری؛ دلاوا ☯ سخی

**دەستکرد** / destkird/: ☜ **دەسکرد**

**دەستکورت** / destkurt/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* بێ‌پارە؛ نەدار ☯ نَدار

**دەستکورتی** / destkurtî/: ناو. *[کینایە]* نەداری؛ بێ‌ئەنوایی ☯ نداری؛ فقر

**دەستکوژ** / destkuj/: ☜ **دەسکوژ**

**دەستکوێر** / destk(i)wêr/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دەستگەوج؛ دەسگەوج؛ نەپارێز ☯ دست (و پا) چُلفتی

**دەستکەتی** / destketî/: ناو. قازانج؛ دەسکەوت؛ وە دەست هاتوو ☯ حاصل؛ بهره

**دەستکەلا**[1] / destkela/: ناو. کەلا؛ هەڵمات 🇮🇷 تیله

**دەستکەلا**[2]: ئاوەڵناو. [مەجاز] خـۆ ڕەپـێش‌خـەر 🇮🇷 کاسەی هر آش

**دەستکەوت** / destkewt/: ☜ **دەسکەوت**

**دەستکێش** / destkêş/: ناو. ١. دەسکێش؛ لەپک ٢. چاوساغی کوێر 🇮🇷 ١. دستکش ٢. عصاکش

**دەستگر**[1] / destgir/: ناو. ١. ☜ **دەزگیران** ٢. ☜ **دەزگیـــر** ٣. وردەواڵـــەی چـــەرچی 🇮🇷 ١. ☜ **دەزگیران** ٢. ☜ **دەزگیر** ٣. کالای پیلەور

**دەستگر**[2]: ئاوەڵـناو. [کینایـە] یاریکـــار؛ ئاریکـــار 🇮🇷 یاری‌کننده

**دەستگران** / destg(i)ran/: ئاوەڵـناو. [مـەجاز] ١. تەمەڵ لە کار ٢. خاوەن مشـتی زۆر بـە ئـازار ٣. تایبەتمەنـدی کەسـێ کـە دەسـکوژی درەنـگ دەمرێ 🇮🇷 ١. تنبل در کار ٢. قوی در ضـربه زدن ٣. ویژگی کسی که ذبحش دیر جان دهد

**دەستگرتی**[1] / destgirtî/: ☜ **دەزگیران**

**دەستگرتی**[2]: ئاوەڵناو. خەریکی کار 🇮🇷 مشغول به کار

**دەستگرۆیی** / destg(i)royî/: ☜ **دەسگیرۆیی**

**دەستگرە**[1] / destg(i)re/: نـاو. دەزگـرە؛ دەسـک؛ دەسگیرە؛ دەسەگیرە؛ هەنگڵ؛ دەسکە؛ دەسـتوو؛ بەشێک لە ئامێر بۆ بە دەستەوە گرتن 🇮🇷 دستگیره

**دەستگرە**[2]: ئاوەڵناو. چاکەکار 🇮🇷 نیکوکار

**دەستگوشراو** / destguşraw/: ئاوەڵناو دەستەوشـار؛ دەسگووش؛ کوشراو یان ئـاوگیراو بـە دەسـت 🇮🇷 دست‌افشار

**دەستگۆ** / destgo/: ئاوەڵناو. [پلار] ژن‌ئاغـە؛ ژناخـە؛ ئالـــی؛ ژن‌وەزۆر؛ شـــاکەڵ؛ شـــەکلە؛ چەکلـــێ؛ ژێردەست و گوێ‌لەمستی ژن (مێرد) 🇮🇷 زن‌ذلیل

**دەستگۆرک** / destgorik/: ☜ **دەسکێش -١**

**دەســـتگەرمی** / destgermî/: نـــاو. [کینایـــە] دەستڕەوانی؛ دۆخی وردە ــ وردە دەسـپێکردن بۆ پێڕاهاتن و تەیار بوون لە کارێکدا 🇮🇷 دست‌گرمی

**دەستگەوج** / destgewc/: ☜ **دەست‌کوێر**

**دەستگیر**[1] / destgîr/: ناو. [کینایە] دەسگیر؛ شـێخی تەریقەت ‹کە دەیگوت شێخی من: من دەسـتگیرم، لە لام وا بوو، لە بەر جەهل و نـەزانی/ کـە پـیر بـووم تێگەییشتم دەستی گرتم، لە کەسب‌وکار و تەحسیلی مەعانی «حاجی قادر»› 🇮🇷 مُرشد

**دەستگیر**[2]: ئاوەڵـناو. دەسگیر: ١. باڵبەسـت؛ گـیراو ٢. [کینایە] پشتیوان؛ یاریدەر؛ یـاوەر 🇮🇷 ١. اسـیر ٢. پُشتیبان

**دەستگیران** / destgîran/: ☜ **دەزگیران**

**دەســـتگیرۆیی** / destgîroyî/: نـــاو. [کینایـــە] دەســـتگرۆیی؛ پشـتیوانیی ماڵــی ‹دەسـتگیرۆیی خەڵکی داماو و هەژاری دەکرد› 🇮🇷 کمک مالی

**دەستگیرە** / destgîre/: ☜ **دەستەگیرە -٢**

**دەستگێر** / destgêr/: ناو. چەرچی؛ دێوەرە 🇮🇷 پیلەور

**دەستگێڕ** / destgêř/: ناو. دەستفرۆش 🇮🇷 دستفروش

**دەستلدەڤ** / destlidev/: ناو. [کینایە] دەستودەڤ؛ ژینی نەمر و نەژی 🇮🇷 زندگی بخور و نمیر

**دەستلڤۆک** / destl(i)vok/: ناو. کردەوە 🇮🇷 رفتار

**دەستلەبان‌دەست** / destlebandest/: ئاوەڵناو. [کینایە] دەس بان دەس؛ دەسەلاتدارتر ‹بێخۆ خـۆت لـێم مـــەگۆڕە! دەســـتلـــەبان دەســـت زۆرە «قســـەی نەستەق»› 🇮🇷 دست بالای دست

**دەســـتلەملان** / destlem(i)lan/: نـــاو. ملـــــەما؛ دەستەوملان 🇮🇷 دست در آغوش

**دەســــــــتلێنەدراو** / destlêned(i)raw/: ☜ دەست‌نەزەدە

**دەستمایە** / destmaye/: ☜ **دەسمایە**

**دەستمایەدار** / destmayedar/: ☜ **دەسمایەدار**

**دەستمچ** / destmiç/: ئاوەڵناو. [کینایە] ڕژد؛ چکووس 🇮🇷 خسیس

**دەستمز** / destmiz/: ☜ **دەسمز**

**دەستمژ** / destmij/: ئاوەڵناو. [مەجاز] هەڵـەخەرج 🇮🇷

ولخرج

**دەستمیز / destmîz/**: ☜ **دەسپەڕ**

**دەستندە / destinde/**: ناو. دەستننە؛ دەستەندە؛ دەسندە؛ دەسنگە؛ نانی بە منەت (منەتباری) ‹گوتی ئێوارە بازاڕێ وەرە ماچت دەمێ، نەمویست/ هەڵۆی کوێستانی کوردستانم و ناژیم بە دەستندە› ☰ جیرە

⊡ **بە دەستندە بوون**: جیرەبەندی بوون؛ دۆخی دابەش کردنی شتێ کە کەمە و بەش هەموو ناکا ‹خۆراک؟ هەتا بڵەی خراپ. دەرمان؟ زۆر کەم و بەدەستندە. حورمەت؟ خۆزگە بە حاڵی سەگ! «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ جیرەبندی بودن

**دەستندەخۆر / destindexor/**: ناو. [کینایە] دەسندەخۆر؛ کەسێ کە چاو لە دەست بێ و نانی بە منەت بخوا ☰ جیرەخوار

**دەستنڤیس / destn(i)vîs/**: ☜ **دەستنوس**

**دەستنمێژ / destn(i)mêj/**: ☜ **دەسنوێژ**

**دەستننە / destinne/**: ☜ **دەستندە**

**دەستنوێژ / destn(i)wêj/**: ☜ **دەسنوێژ**

⊡ **دەستنوێژ سوک بوون**: [پلار] دەستنوێژ شکان ‹ئەشەدەمبیللا تۆ لە تەیارە ناترسی؛ بەلام ڕەنگە دەستنوێژت سووک بووبێ! «هەژار، چێشتی مجێور»›. هەروەها: **دەسنوێژ شکان؛ دەسنوێژ گرتن** ☰ وضو باطل شدن

**دەستنوس[1] / destnûs/**: ناو. دەستنڤیس؛ دەسنووس؛ دەسنویس؛ کتێب یان هەر شتێکی وەکوو کتێب کە بە دەست نووسرابێتەوە ‹دەستنووسێکی دیوانی مەولەوی› ☰ دستنویس

**دەستنوس[2]**: ناوەڵناو. دەسنووس؛ دەسنویس؛ بە دەست نووسراو ‹دیوانی دەستنووس› ☰ دستنویس

**دەستنەزدە / destnezede/**: ناوەڵناو. دەستلێنەدراو؛ هەر وەک خۆێ ماو ☰ دستنخورده

**دەستنیشان / destnîşan/**: ناو. دەسنیشان؛ کاری دیاری کردن ☰ علامتگذاری؛ عمل نشان کردن

⊡ **دەستنیشان/ دەسنیشان کردن**: ١. دیاری کردن؛ بە شتێک نیشان دان ‹لە نەخشەکەدا ماڵی خۆمانم دەستنیشان کرد› ٢. کردنە چاو؛ هەڵبژاردن بۆ مەبەستێ ‹کچێکیان بۆم دەستنیشان کردبوو› ☰ ١. مشخص کردن ٢. نشان کردن

**دەستنێژ / destnêj/**: ناوەڵناو. ١. بە دەست نێژراو (نەمام و ...) ٢. [کینایە] خزمەتکاری خۆشەویست ☰ ١. دستنشانده (نهال) ٢. خدمتگزار محبوب

**دەستواڵا / destwała/**: ناوەڵناو. [کینایە] دەسبەتاڵ؛ دەسهاڵی ☰ تُهیدست

**دەستوبرد[1] / dest û bird/**: ناو. [کینایە] دەسوبرد؛ چالاکی ‹دەستوبردی نییە، زۆر خاوە› ☰ چالاکی؛ ورزیدگی

⊡ **دەستوبرد کردن**: خێرا کەوتنە کار ‹چونکە پارەی پار ئەباری بە بار/ دەستوبردمان کرد لێی کەوتینە کار «موفتی پێنجوێنی»› ☰ سریع وارد عمل شدن

**دەستوبرد[2]**: ناوەڵکار. [کینایە] دەسوبرد؛ خێرا؛ بە پەلە ‹دەستوبرد چوو و هاتەوە› ☰ ضربتی؛ سریع

**دەستوپێ / dest û pê/**: ناو. ١. ☜ **دەستوپێوەند** ٢. ☜ **دەسوپەیمان**

**دەستوپێسپی / dest û pês(i)pî/**: ناوەڵناو. [کینایە، پلار] دەسسارد؛ دەسسپی: ١. کار لە دەست نەهاتوو ٢. بە ناز بارهاتووی فێرەکار نەکراو ☰ ١. دستوپاچلفتی ٢. نازپرورده

**دەستوپێوەند / dest û pêwend/**: ناو. [پلار] دەست و پێ؛ کۆمەڵی خزمەتکاران و ژێردەستان ☰ خدم و حشم

**دەستوچاوپاک / dest û çawpak**: ئاوەڵناو. [کینایە] دەستودڵپاک؛ دروستکار (لە باری ماڵی و جینسییەوە) 🇮🇷 پاک

**دەستوخەت / dest û xet**: ناو. دەستخەت؛ دەسخەت؛ دەس‌وخەت 🇮🇷 دستخط

**دەستودڵباز / dest û dilbaz**: ئاوەڵناو. [کینایە] دەهندە؛ دلاوا 🇮🇷 سخاوتمند

**دەستودڵپاک / dest û dilpak**: ☜ **دەستوچاوپاک**

**دەستودو / dest û dû**: ناو. [کینایە] هێز و توانا 🇮🇷 نیرو و توان جسمی

**دەستودەڤ / dest û dev**: ☜ **دەستلەدەڤ**

**دەستومست / dest û mist**: ناو. [کینایە] کار بە دەستی خۆ کردن و چاوەڕوانی کەس نەبوون 🇮🇷 اقدامِ بدون اتکا به دیگران

**دەستومشتاخ / dest û miştax**: ☜ **دەستومشتاق**

**دەستومشتاق / miştaq û dest**: ناو. دەستومشتاخ؛ دەس‌ومشتاق؛ دەستومۆچ؛ دەس‌ومۆچ؛ تەوقە؛ تۆقە 🇮🇷 مُصافحه

**دەستومۆچ / dest û moç**: ☜ **دەستومشتاق**

**دەستوەر / destwer**: ☜ **دەستەبەر ـ١**

**دەستوەشێن / destweşên**: ناو. [کینایە] دەس‌وەشێن؛ شێتێ کە هێرش بۆ خەڵک ببا 🇮🇷 دیوانەی زنجیری

**دەستو / destû**: ☜ **دەستگرە**[1]

**دەستوور**[1] **/ destûr**: ناو. دەسوور: ١. فەرمان؛ فەرمانێک لە لایەن سەرۆکایەتی یان کەسێکی سەرترەوە کە تێیدا لە سەر ئەنجامدانی کارێک جەخت کراوە ‹دەستووری فەرماندەیە› ٢. قانوونی ئەساسی، بریتی لە بەڵگەنامەی بناخەیی کە لە وڵاتێکدا سروشتی دەسەڵات، ئەرک و مافەکانی شارۆمەندان دەسنیشان دەکا ٣. بەرایی؛ ئیجازە ٤. عیماڵە؛ حوقنە ٥. ڕێ‌وشوێن؛ داب و نەریت 🇮🇷 ١. فرمان؛ دستور ٢. قانون اساسی ٣. اجازه ٤. اماله ٥. راه و رسم؛ آداب

⊡ **دەستوور دان**: ١. فەرمان دان ٢. ئیجازە دان 🇮🇷 ١. امر کردن؛ فرمان دادن ٢. اجازه دادن

**دەستوور کردن**: عیماڵە کردن 🇮🇷 اماله کردن

• **دەستوور**[2]: پاشەوشە. ئاسا؛ ڕەنگ ‹پەروانەدەستوور بسۆزە بە شەوق/ شەوق ئەو ئاير لێت مەبۆ بە تەوق «بێسارانی»› 🇮🇷 ـ آسا

**دەستە**[1] **/ deste**: ناو. دەسە: ١. کۆمەڵ؛ دەسە ‹دەستەی چەکداران› ٢. ژمارەی دوازدە لە سەعاتدا ٣. دەسک؛ جێگای دەست لە ئامرازدا 🇮🇷 ١. دسته؛ گروه ٢. شماره‌ی دوازده در صفحه‌ی ساعت ٣. دسته

⊡ **دەستە کردن**: دەسە کردن؛ بەستە ـ بەستە لە سەر یەک دانان 🇮🇷 دسته‌بندی کردن

**دەستە**[2]: ئاوەڵناو. ١. ناونجی؛ مامناونجی: الف) نێوان ئەستوور و باریک ب) نێوان درێژ و کورت پ) نێوان گەورە و بچووک ٢. هاوتا؛ هاوشان: الف) هاوماڵ ب) هاوعومر پ) هاوجسن 🇮🇷 ١. متوسط: الف) بین ضخیم و نازک ب) بین دراز و کوتاه پ) بین بزرگ و کوچک ٢. همسان: الف) همتا ب) همسال پ) همجنس

**دەستە ـ**[3]: پێشوشە. ١. کۆمەڵە؛ تاقم ‹دەستەکوڕ› ٢. بۆ گرتنە دەستەوە ‹دەستەگوڵ› ٣. شەریک؛ هاوبەش لە شتێکدا ‹دەستەبرا؛ دەستەدز› ٤. ژێهاتی؛ هەڵکەوتە ‹ئەحمەد تەوفیق دەستەپیاوێکی بەلەباریکی جوان چاک، سپیلکەڵە، مووی لە ڕەشییان بریقەی دەهات. قەت لە کار کردن ماندوو نەدەبوو «چێشتی مجێور»› 🇮🇷 ١. گروه ٢. دسته ـ ٣. شریک ٤. برجسته

**دەستەئەژنۆ / deste'ejno**: ☜ **دەستەوئەژنۆ**

**دەستەباڵا / destebała**: ئاوەڵناو. بەژنڕێک؛ ئەنامڕێک ‹ڕۆژێکی دی ـ سەر لە ئێوارە ـ سەیدێکی ڕیش سپی تەنک، دەستەباڵای لاواز هاتە حەوشەی

دیوەخان و قسەی دەگەڵ مام حوسێن کرد «هەژار، چێشتی مجێور» خوش‌اندام

**دەستەبرا / desteb(i)ra/**: ناو. دەسەبرا؛ دۆستی خۆشەویستی پیاو بۆ پیاو دوست صمیمی

**دەستەبوخچە / destebuxçe/**: ناو. دەسەبوخچە؛ بوخچە و پڕێسکەی ژنانە بستەی لوازم زنانە

**دەستەبەر / desteber/**: ناو. دەسەبەر: ١. پاوەر؛ دەست‌وەر؛ دەستەوەر؛ زامن؛ کەسێ کە لە جێی کەسێکی‌تر شتێک لە ئەستۆ بگرێ ٢. عەرەبانەی کە بە دەست لێ دەخوڕن ٣. ناوە؛ دەفری قوڕ کێشان ١. ضامن ٢. چرخ‌دستی ٣. ظرف گِل‌کشی

⊡ **دەستەبەر بوون**: لە ئەستۆ گرتن ‹ئایا شۆڕەوی دەستەبەر دەبێ کە بەعسی خودموختاریمان بێ کەم و زیاد بدەنێ و پەیمانێکی داویانە پێکی بێنن؟ «هەژار، چێشتی مجێور»› متعهد شدن

**دەستەبەر کردن**: لە ئەستۆ گرتنی ڕاستی و دروستی و بەڕێوە چوونی شتێک ‹دەوڵەت مووچە و مافی کارمەندانی دەستەبەر دەکا› ضمانت کردن

**دەستەبەرنامە / destebername/**: ناو. نووسراوەیەک کە بە پێی ئەوە کەس یان دامەزراوەیەک بەڕێوە چوونی کارێک وە ئەستۆ دەگرێ ضمانت‌نامه

**دەستەبەرە / destebere/**: ناو. دەسەوەرە: ١. تەختێ کە بە چوار کەس شتی پێ دەگوێزنەوە ٢. زەمبە؛ برانکارد؛ تەختی گواستنەوەی نەخۆش یان بریندار ١. تخت‌روان ٢. بُرانکارد

**دەستەبەری / desteberî/**: ناو. کار و دۆخی دەستەبەر بوون ضمانت

**دەستەبەندی / destebendî/**: ناو. دەسەبەنی؛ ١. کار و ڕەوتی پۆلێن کردن؛ دەستە کردن؛ ڕێک کردن و لە لای یەک دانانی شتی وەک یەک ٢. کاری پێکەوە هاوقۆڵ بوون و بوونە دەستەیەک بۆ وەپێش خستنی کارێک. هەروەها: **دەستەبەندی کردن** ١و٢. دسته‌بندی

**دەستە پاچە / destepaçe/**: ئاوەڵناو. دەسەپاچە؛ دەسەپارچە؛ سەرلێ‌شێواو. هەروەها: **دەستەپاچە بوون** دستپاچه

**دەستەجڵەو / destec(i)łew/**: ناو. دەسەجڵەو؛ دەسکەوسار؛ هەوسار افسار

**دەستەچرا / desteç(i)ra/**: ناو. فتیلە؛ چرادەستی چراغ فتیله‌دار

**دەستەچز / desteçiz/**: ناو. کاری تێ‌هەڵچەقان عمل خلیدن

**دەستەچەک / desteçek/**: ناو. دەسەچەک؛ پەڕاوێکی چاپکراو، لە خۆگری چەند گەلا پسوولەی چەک کە لە لایەن بانکەوە بە مشتەرییەکانی دەدرێت دسته‌چک

**دەستەچیلکە / desteçîlke/**: ☜ دەستەچیلە

**دەستەچیلە / desteçîle/**: ناو. دەس‌ئایر؛ دەساگر؛ دەساور؛ دەسایر؛ دەستەچیلکە؛ دەسەچیلە؛ دەسەچیلە؛ پڕ و پووش بۆ ئاگر کردنەوە افروزنه

**دەستەخورد / destexurd/**: ناو. داردۆژەنگ چوب زبانه‌دار مشک

**دەستەخوشک / destexuşk/**: ناو. دەسەخوشک؛ دۆستی خۆشەویستی ژن بۆ ژن دوست صمیمی زن برای زن

**دەستەخۆ / destexo/**: ئاوەڵکار. دەستەوخۆ؛ دەسبەجێ؛ خێرا فوری

**دەستەداو / destedaw/**: ناو. دەسەداو: ١. کۆمەڵێک داو بۆ ڕاو ٢. *[کینایە]* پیلان؛ نەخشەی نهێنی بۆ کاری ناڕەوا ١. دسته‌ی دام شکار ٢. دسیسه

**دەستەدز / destediz/**: ناو. دایکەدزە ‹هەر شارێکمان دوگمەی یەخەی دەترازێنرێ/ دەستەدز و پاشەدز و حەسحەسی شار، هەر خۆمانین «پەشێو»› شریک

دزد

**دەستەدوو**[1] / destedû/: ناو. دەستەکەوشە؛ دەستەگۆشە؛ دەسەکەوشە؛ دەزگری هەوجار ☰ دستگیرەی خیش

**دەستەدوو**[2]: ئاوەڵناو. دەسەدوو؛ بەکاربراوی وا کە ئێستاش بەکار بێ ☰ دست دوم

**دەستەر** / dester/: ☜ دەستەرە

**دەستەرە** / destere/: ناو. دەستەر؛ شەقڵ ☰ مُهر چوبی خرمن

**دەستەریقانە** / desterîqane/: ناو. دیاری؛ دەسەدیاری؛ دەسەدیار؛ دەسایزی ☰ سوغات

**دەستەسڕ** / destesiř/: ☜ دەسەسڕ

**دەستەسوار** / destes(i)war/: ناو. گیڤاڵە ☰ تیپ سواران

**دەستەشکاو** / desteş(i)kaw/: ئاوەڵناو. [کینایە] ۱. ماڵوێران؛ کۆڵەوار ۲. فریوخواردوو ☰ ۱. خانەخراب ۲. فریب‌خوردە

**دەستەشکێن** / desteş(i)kên/: ئاوەڵناو. [کینایە] فریوخواردوو ☰ فریب‌خوردە

**دەستەشلک** / desteşilk/: ناو. گیایەکی چەن ساڵانەی خۆڕسکە، پاییزان دوای گەڵاڕێزان گوڵ دەکا، لە زافەران دەچێ ☰ زعفران مرغزار

**دەستەڤایی** / destevayî/: ☜ دەستەوام

**دەستەک**[1] / destek/: ناو. دەسەک: ۱. ئالوودار ۲. ڕیزە دێراوێک ۳. بیانوو؛ پەڵپ ☰ ۱. تیر سقف ۲. چند ردیف کشت ۳. بهانە

**دەستەک**[2]: ئاوەڵناو. دەسەک؛ دیاریکراو ☰ نشانەشدە

**دەستەکچ** / destekiç/: ناو. کچی عازەو ☰ دختر بالغ

**دەستەکدز** / destekdiz/: ناو. دەستەدز ☰ شریک دزد

**دەستەکوتکێ** / destekutkê/: ☜ دەستەکوتە

**دەستەکوتە** / destekute/: ئاوەڵکار. دەستەکوتکێ؛ کاری دەست کوتان ☰ عمل با دست جُستن

**دەستەکوتێ** / destekutê/: ناو. پەڵەکوتێ؛ دەسکوتانی کوێرانە ☰ عمل کورانە دست گرداندن

**دەستەکوڕ** / desetkuř/: ناو. جحێڵ؛ تازەلاو ☰ پسر نوجوان

**دەستەکەدار** / destekedar/: ناو. کێزم؛ کاری داکوتانی چێوی پەرژین ☰ عمل کوبیدن چوب پرچین

**دەستەکەوشە** / destekewşe/: ☜ دەستەدوو[1]

**دەستەگوڵ** / desteguł/: ناو. ۱. دەسکەگوڵ ۲. کاری یەکەم گۆرەوی هەڵگرتن لە گۆرەوێنەدا ☰ ۱. دستە گل ۲. عملی در جوراب‌بازی

**دەستەگۆشە** / destegoşe/: ☜ دەستەدوو[1]

**دەستەگیرە** / destegîre/: ناو. ۱. مەنگەنەی مۆرهەڵقەن ۲. دەستگیرە؛ دەسگیرە ☰ ۱. دستگاه مُهرکوبی ۲. دستگیره

**دەستەلات** / destełat/: ☜ دەسەلات

**دەستەلاتدار** / destełatdar/: ☜ دەسەلاتدار

**دەستەلاتداری** / destełatdarî/: ☜ دەسەلاتداری

**دەستەلە** / destełe/: ناو. گۆزەڵکە ☰ کوزەی کوچک

**دەستەلێن** / destełên/: ☜ دەسەلێن

**دەستەمستە** / destemiste/: ناو. دەستەندوو؛ دەسگیرەی جووتیار لە پاشبارەدا ☰ دستگیرەی خیش

**دەستەمل** / destemil/: ☜ دەستەملان

**دەستەملان** / destem(i)lan/: ناو. دەستەمل؛ دەستەملانێ؛ دەسەملان؛ دەسەملانێ؛ دەسەوملان؛ کار یان ڕەوتی دەست کردنە مل ☰ عمل دست بە گردن انداختن

**دەستەملانێ** / destem(i)lanê/: ☜ دەستەملان

**دەستەملە** / destem(i)le/: ناو. زۆرانی دەست ☰ عمل مُچ انداختن

**دەستەمۆ**[1] / destemo/: ناو. [پلار] کارەکەر ☰ کُلفَت

**دەستەمۆ**[٢]: ئاوەڵناو. دەسەمۆ؛ کەوی ‹لێم حەرامە دانەو و ئاوی حەماماتی حەرەم/ من کە بازی دیدەبازم نەک شەوارەی دەستەمۆم «نالی»› ☰ رام؛ دست‌آموز

**دەستەمۆیی** / destemoyî/: ناو. دەسەمۆیی؛ رامی؛ دۆخی کەوی بوون ☰ حالت رام بودن

**دەستەنداز** / destendaz/: ناو. دەسەناز؛ تەسە؛ کۆسپی سەر ڕێگە ☰ دست‌انداز

**دەستەندوو** / destendû/: ☜ **دەستەمستە**

**دەستەندە** / destende/: ☜ **دەستندە**

**دەس‌تەنک** / destenik/: ☜ **دەس‌تەنگ**

**دەس‌تەنکی** / desten(i)kî/: ☜ **دەس‌تەنگی**

**دەس‌تەنگ** / desteng/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دەست‌تەنک؛ دەس‌تەنک؛ نەدار ☰ فقیر؛ تنگدست

**دەس‌تەنگی** / destengî/: ناو. *[مەجاز]* دەس‌تەنکی؛ نەداری؛ بێ‌پووڵی ☰ فقر؛ تنگدستی

**دەستەنوێن** / desten(i)wên/: ناو. بەستەک؛ پێخەف ☰ رختخواب

**دەستەوئەژنۆ** / destew'ejno/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* دەست‌بەئەژنۆ؛ دەستەئەژنۆ؛ دەس بە زرانی؛ خەمبار؛ مات ☰ غمگین

**دەستەوا** / destewa/: ناو. ١. شت بە شتی وەک خۆی گۆڕینەوە ‹ئێژن دەستەوا کاریکی خاسە/ خۆتان ئەفەرموون دنیا تەقاسە «حەقیقی»› ٢. خوازە؛ ئیستیعارە ☰ ١. معاملەی پایاپای ٢. استعاره

**دەستەوار** / destewar/: ☜ **دەستەوارە**

**دەستەوارە** / desteware/: ناو. دەستەوار؛ دەسەوار؛ دەسەوارە: ١. باوەشێک داری سووتەمەنی ٢. یەکەی نان (دەستەیەک نان) ☰ ١. یک بغل هیزم ٢. یک دسته نان

**دەستەواژە** / destewaje/: ناو. کۆژ؛ زاراوە؛ وشە یان ڕستەیەک کە لە ناو دەستەیەکی دیاریکراو، یان لە زانست، هونەر، کار یان پیشەیەکدا، واتایەکی تایبەت و جیاکاری هەیە ☰ اصطلاح

**دەستەوام** / destewam/: ناو. دەستەڤایی؛ دەستیاو؛ دەسەوام؛ کاری یاری دانی یەکتر بە نۆرە ‹مامە! مامە! دنیا دەستەوامە› ☰ همیاری

**دەستەوانە** / destewane/: ناو. دەسەوانە: ١. لەپک؛ دەسکێش؛ پۆشاکی دەست ٢. دەستبەند؛ لیزگە مووروو کە لە دەستی دەکەن ☰ ١. دستکش ٢. دستبند

**دەستەواو** / destewaw/: ناو. دەستقەرز؛ دەس‌قەرز؛ دەستیاو؛ یارمەتی بە نۆرە ☰ کمک متقابل و نوبتی

**دەستەوبەستە** / destewbeste/: ☜ **دەستەودایرە**

**دەستەوخۆ** / destewxo/: ☜ **دەستەخۆ**

**دەستەوداوێن** / destewdawên/: ئاوەڵناو. تکاکار ‹دەستەوداوێنی شێخ و مەلا بووم› ☰ دست‌بەدامان

**دەستەودایرە** / destewday(i)re/: ناو. *[پەلار]* دەستەوبەستە؛ دەسەوبەسە؛ کۆمەڵێ کە خۆبەخۆیی بکەن ☰ دارودستە

**دەستەودوعا** / destewdo'a/: ناو. ڕەوتی دۆعا کردن ☰ دُعا؛ نیایش

▣ **دەستەودوعا بوون**: دۆعا کردن ‹چونکە نرخی ماچی تۆی گۆڕی هەموو دەستەودۆعان/ خەتتی نەوخێزت وەکوو زولفت خودا پیری نەکا «حاجی قادر»› ☰ دعا کردن

**دەستەوسار** / destewsar/: ناو. دەستەجڵەو؛ هەوسار ☰ افسار

**دەستەوسان** / destewsan/: ☜ **دەستەوستان**

**دەستەوستان** / destewistan/: ئاوەڵناو. دەستەوسان؛ دەسەوسان؛ ناچار؛ بێ‌عیلاج ‹ئەی میللەتی مەزڵووم و فەقیر و دەستەوستان/ ئەی کوردی پەراکەندە لە گەرمێن و لە کوێستان «مەلا مارف کۆکەیی»› ☰ ناچار؛ لاعلاج

**دەستەوشار** / destewşar/: ئاوەڵناو. دەسگووش؛ دەست‌گوشراو؛ کوشراو یان ئاوگیراو بە دەست ☰

دستافشار

**دەستەوملان / destewm(i)lan/:** ☜ **دەستلەملان**

**دەستەوناو / destewnaw/:** ناو. دەسەناو؛ ڕێگەی سەر بەرەژێر ☰ راه شیبدار

**دەستەونەزەر / destewnezer/:** ئاوەڵکار. دەستبەسینە؛ دەسوەسینە؛ دەستڤیلک؛ ملکەچ و گوێڕایەڵی فەرمان ‹ڕۆژپەرستی رووتە نالی! بۆیە دائیم وەک غولام/ زەرد و گەردن کەچ لە دەرگات، حازرە دەستەونەزەر «نالی»› ☰ دستبەسینە؛ مُطیع

**دەستەوەر / destewer/:** ☜ **دەستەبەر-١**

**دەستەوەکری / destewek(i)rî/:** ناو. کاری دەست کردنەوە و بە گژ دوژمندا چوون ☰ مقابلە با دشمن

**دەستەوهەوراز / deste w hewraz/:** ناو. سینەکێش؛ ئامالْ هەوراز ☰ سینەکش

**دەستەویەخە / destewyexe/:** ئاوەڵناو. دەسەویەخە؛ دەسەویەقە: ١. دەسبەیەخە ٢. *[کینایە]* نزیک؛ نێزیک ☰ ١. گلاویز ٢. نزدیک

**دەستەهارە / destehaře/:** ناو. ١. دەستاڕ؛ دەسار؛ هارە؛ هارەکڕ ٢. دەستەی هارە ☰ ١. دستاس ٢. دستەی دستاس

**دەستەیەک / desteyek/:** ئاوەڵناو. نوێ؛ تازە ‹کالای دەستەیەک› ☰ آکبند

**دەستهاڕ / desthař/:** ☜ **دەساڕ**

**دەستهەڵ / desthel/:** ئاوەڵناو. *[کینایە]* چالاک ☰ چالاک

**دەستهیشک / desthîşk/:** ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ١. نەدار؛ هەژار ٢. ڕژد و چکووس ☰ ١. فقیر ٢. خسیس

**دەستی[١] / destî/:** ناو. دەسی: ١. باقەگیا ٢. دەسەگیرە؛ هەنگڵ؛ دەسکە؛ دەستوو؛ بەشێک لە ئامێر بۆ بە دەستەوە گرتن ☰ ١. بستەی گیاه؛ بافە ٢. دستگیرە

**دەستی[٢]:** ئاوەڵناو. دەسی: ١. پێوەندیدار بە دەستەوە ‹کاری دەستی› ٢. نەختی؛ نەغدی ‹پارەی دەستی› ☰ ١. دستی ٢. نقدی

**دەستی[٣]:** ئاوەڵکار. دەسی: ١. نەختی؛ بە نەخت ‹پارەکەی دەستی دامێ› ٢. قەستی؛ لە قەست ☰ ١. نقدی ٢. عمدی

**دەستی[٤]:** ئامراز. وەک؛ وەکوو؛ وەکی؛ وەکەتی ‹ئەم گەنمە دەستی گەنمەکەی پارە› ☰ مثلِ؛ مانندِ

**دەستیار / destyar/:** ناو. یاریدەر؛ یارمەتیدەر؛ بەردەست ☰ دستیار

**دەستیاو / destyaw/:** ناو. ١. پاداشی چاکە ٢. ☜ **دەستەواو** ☰ ١. پاداش نیکی ٢. ☜ **دەستەواو**

**دەستی ـ دەستی / destî destî/:** ئاوەڵکار. دەستی؛ دەسی ـ دەسی؛ لە قەست ‹دەستی ـ دەستی بە کوشتنی دا› ☰ دستی ـ دستی؛ عمداً

**دەستێر / destêr/:** ☜ **دەستتێر**

**دەسچن / desçin/:** ☜ **دەستچن**

**دەسچوو / desçû/:** ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دەسدار؛ خاوەنزۆر؛ زۆردار ☰ بانفوذ

**دەسچوویی / desçûyî/:** ناو. *[مەجاز]* بڕ؛ بڕشت ☰ اعتبار؛ وجهە

**دەسچین / desçîn/:** ☜ **دەستچن**

**دەسحێب / desĥêb/:** ناو. تەزبێح ☰ تسبیح

**دەسخڕۆ / desx(i)řo/:** ☜ **دەستخەڕۆ**

**دەسخورێن / desxurên/:** ناو. دەسخورێنە؛ خەلەنگ؛ دورزیلە؛ گەزنە؛ گەزەنە؛ گەزەنێ؛ گەزنک؛ گەزینک؛ گەزگەزک؛ گەزگەسک؛ گەزگەزۆک؛ گەزگەزکە؛ گەزۆک؛ گەسگەسک؛ گزگز؛ گزگزە؛ ئاڵۆشە؛ گیایەکی ئالیکی بە گەڵا و لاسکی کوڵکنەوە، لە پێست کەوێ دەیچووزێنێتەوە ☰ گزنە

**دەسخورێنە / desxurêne/:** ☜ **دەسخورێن**

**دەسخۆر[١] / desxor/:** ناو. چێشتی گراری توندەوەبوو کە تێی ناگوشرێ ☰ آش غلیظ

**دەسخۆر**۲: ئاوەڵناو. *[پلار]* هەس؛ خەستەوە بوو ▤ غلیظ

**دەسخۆش** / desxoş/: دوعا. وشەی لە جێگەی ئافەرین ▤ دست مریزاد

**دەسخۆشانە** / desxoşane/: ناو. دەستخۆشانە؛ دەس‌وەشانە؛ دەس‌مەریزانە؛ شیرینی وەستا یان شاگرد ▤ انعام شاگرد و استاد

**دەسخۆشی** / desxoşî/: ☜ **دەستخۆشی**

**دەسخەت** / desxet/: ☜ **دەستوخەت**

**دەسخەڕۆ** / desxeřo/: ئاوەڵناو. دەستخەڕۆ؛ فریودراو؛ خەڵەتاو ‹بە هۆشەی زۆردار مەبە دەسخەڕۆ/ لەسەر خوو و ڕەوشت پیاوانە بڕۆ «قانع»›. هەروەها: **دەسخەڕۆیی** ▤ فریب‌خورده

**دەسخەڕە** / desxeře/: ئاوەڵناو. ۱. دەستخەڕۆ؛ خەڵەتاو ۲. دۆخی بە تەمای یەکێ‌تر، لە کار و کاسبی بوون. هەروەها: **دەسخەڕە بوون؛ دەسخەڕە کردن** ▤ ۱. فریب‌خورده ۲. علاف

**دەسدار** / desdar/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دەسچوو؛ خاوەن‌زۆر؛ زۆردار ▤ بانفوذ

**دەسداری** / desdarî/: ناو. *[مەجاز]* ۱. دەوڵەمەندی ۲. دەس‌ڕۆیشتوویی ▤ ۱. ثروتمندی ۲. نفوذ

**دەسدرو** / desd(i)rû/: ئاوەڵناو. دەسدوور؛ بە دەست دووراو ▤ دست‌دوز

**دەسدرێژ** / desd(i)rêj/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دەستدرێژ؛ زۆرکار؛ داگیرکەر ▤ متجاوز

**دەسدرێژی** / desd(i)rêjî/: ناو. *[مەجاز]* دەستدرێژی: ۱. هەوڵی ناڕەوا بۆ سوود وەرگرتن لە شتێ کە هی یەکێکی‌ترە ۲. *[رامیاری]* بە کار هێنانی هێزی چەکدار لە لایەن وڵاتێکەوە لە دژی سەربەخۆیی و یەکپارچەیی وڵاتێکی‌تر ▤ ۱و۲. تجاوز

**دەسدور** / desdûr/: ☜ **دەسدرو**

**دەسرازە** / desraze/: ناو. کەژووی بەستنەوەی دەست و لاقی منداڵ لە لانکەدا ‹لە نێو کورد نەبێ دەسرازە نییە/ ئەو بەند و قفڵ و قەرازە چییە؟ «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ▤ نوار پشمی بستن نوزاد در گهواره

**دەسرۆک** / desrok/: ناو. دەسماڵ؛ دەسرە؛ دەسەر؛ دەسۆک؛ تەهرە؛ مەندیل؛ کەفی؛ کەهیک؛ پەشتەماڵ؛ دەرچاف؛ بەشە پارچەیەکی چوارگۆش بۆ سڕین ▤ دستمال

**دەسرۆکە** / desroke/: ناو. دەسماڵی پچووک ‹لادە دەسرۆکەیی هەوری لە جەبین/ دەرکەوێ شەمس و قەمەر، نوور و زیا «نالی»› ▤ دستمال کوچک

**دەسرە** / desre/: ناو. ۱. دەسرۆک؛ دەرسۆک ۲. مێزەر ▤ ۱. دستمال ۲. دستار

◙ **دەسرەی کاغەزی**: دەسماڵ کاغەزی؛ دەسرەی لە کاغەزی لۆکە بۆ یەکجار سڕین ▤ دستمال کاغذی

**دەسڕامووس** / desřamûs/: ناو. دەسبۆس؛ دەس‌ماچکەر؛ ئەو کەسەی کە بە نیشانەی ڕێز گرتن، دەستی کەسێک ماچ دەکات ▤ دستبوس

**دەسڕامووسی** / desřamûsî/: ناو. دەسبۆسی؛ دەس‌ماچکەری؛ دەس‌ماچان؛ کاری ماچ کردنی دەستی کەسێک بۆ نیشان‌دانی چکۆلەیی و خاکەڕایی ▤ دستبوسی

**دەسڕۆیشتوو** / desřoyiştû/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* بەدەسەڵات؛ دەسەڵاتدار. هەروەها: **دەسڕۆیشتوویی** ▤ بانفوذ

**دەسڕەسی** / desřesî/: ناو. دەسەیاو؛ پەردەژی؛ هەنا ▤ دسترسی

**دەسڕەنج** / desřenc/: ناو. خەبس؛ ڕەنج ▤ رنج

**دەسڕەنگین** / desřengîn/: ئاوەڵناو. دەس‌نەخشین؛ کارجوان؛ بەهونەر ▤ هُنرمند؛ نقشگر

**دەسڕێژ** / desřêj/: ناو. دەستڕێژ؛ کاری گوللەتەقاندنی زۆر و بەتێکڕایی. هەروەها: **دەسڕێژ (لێ) کردن** ▤ شلیک گروهی

**دەسژیر** / desjîr/: ئاوەڵناو. دەسراست؛ خاوەن

دەستی بەکار بۆ کاری ورد و ڕێک ☰ دست‌ماهر

**دەس‌سارد** / dessard/: ☜ **دەستوپێ‌سپی**

**دەس‌سپی** / dess(i)pî/: ☜ **دەستوپێ‌سپی**

**دەس‌سڤک** / dess(i)vik/: ☜ **دەستسوک**

**دەس‌سوک** / dessûk/: ☜ **دەستسوک**

**دەسسەچیلە** / desseçîle/: ☜ **دەستەچیلە**

**دەس‌شاش** / desşaş/: ☜ **دەسبلاو**

**دەسشۆری** / desşorî/: ناو. دەستشۆر؛ دەستشۆرک ☰ دستشویی

**دەس‌شێل** / desşêl/: ئاوەڵناو. بە دەست شێلراو (هەویر یان قوڕ) ☰ با دست چلانده (خمیر یا گِل)

**دەسفرۆش** / desf(i)roş/: ☜ **دەستفرۆش**

**دەسفەنگ** / desfeng/: ناو. چەشنی ڕاگرتنی تفەنگ بە لاری لە سەر سنگ، کە لوولەکەی بە لای چەپدا و قۆناخەکەی بەرەو خوار بە لای ڕاستدا بێ ☰ دست‌فنگ

**دەس‌قورس** / desqurs/: ☜ **دەستقورس**

**دەس‌قوچاو** / desqûçaw/: ☜ **دەستقوچاو**

**دەس‌قوچیاگ** / desqûçyag/: ☜ **دەستقوچاو**

**دەس‌قوچیاو** / desqûçyaw/: ☜ **دەستقوچاو**

**دەسقەرز** / desqerz/: ☜ **دەستقەرز**

**دەسقەس** / desqes/: ئاوەڵناو. لەقەست؛ ئەنقەست ☰ عمدی

**دەسک** / des(i)k/: ناو. دەسکە: ۱. ئامرازی برنج کوتان ۲. ☜ **دەستگرە**[۱] ۳. چەپک؛ چەپە ٤. دەزوو؛ دەزگ ٥. گوڵی لە داس هەڵوەریو ٦. جێگەی بە دەست گرتن لە هەوسار و جڵەو ☰ ۱. ابزار برنجکوبی ۲. ☜ **دەستگرە**[۱] ۳. دسته (گل یا گیاه) ۴. نخ ۵. خوشه‌ی از داس ریخته ۶. جای دست در افسار

⊡ **دەسک کردن**: ۱. دەسک لێنان ۲. هەڵگرتنەوەی گوڵی لە داس هەڵوەریو ☰ ۱. نصب کردن دسته بر ابزار ۲. خوشه چیدن پس از درو

**دەسک لە دوو نەکردن**: *[کینایە]* بە تۆزەکەیشیدا نەگەیشتن؛ زۆر کەمتر و لە خوارتر بوون ‹مەگەر خەڵکی سووریا، بۆ پووڵپەرستی بگەنە لوبنانیان، دەنا عەجەمیش دەسکیان لە دوو ناکەن «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ بە گرد (کسی، چیزی) نرسیدن

**دەسکار**[۱] / deskar/: ☜ **دەسکرد**

**دەسکار**[۲]: ئاوەڵناو. چێ‌کراو ‹دەسکاری ئەڵمانە› ☰ ساخت

**دەسکاری** / deskarî/: ☜ **دەستکاری**

**دەسکاونگ** / deskawing/: ناو. دەستاونگ؛ دەسک‌وئاونگ؛ دەسکەوان؛ ئاوان‌دەساوان؛ ئاونگ بە دەستەکەیەوە ☰ هاون و دسته‌اش

**دەسک . دەسک** / desik desik/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* بێ‌شەرت و بەقا ☰ بی‌وفا

**دەسکراوە** / desk(i)rawe/: ☜ **دەسبلاو**

**دەسکرد** / deskird/: ئاوەڵناو. دەستکار؛ دەستکرد؛ دەسکار: ۱. دەسکوت؛ دەست‌ساز؛ دروستکراو بە دەست و بێ‌کەڵک وەرگرتن لە ماشین ‹بۆمبی دەسکرد› ۲. ناسروشتی؛ دروستکراو لە ڕێی پیشەسازییەوە ۳. *[مەجاز]* دروستکراو؛ بەرهەم ‹دەسکردی چین بایەخێکی نییە› ☰ ۱. دست‌ساز ۲. مصنوعی ۳. ساخته شده

**دەسکلە** / desk(i)le/: ناو. زەنبیلە ☰ زنبیل

**دەسکوئاونگ** / desk û 'awing/: ☜ **دەسکاونگ**

**دەسکوت** / deskut/: ☜ **دەسکرد-۱**

**دەسکورت** / deskurt/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* نەتێر؛ هەوجەدار؛ کیسەبیمار ‹بەو پەڕی تەسەلی دەژیام و بە هەموو توانا یارمەتی دۆستانی دەسکورتی خۆم دەکرد «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ دست‌تنگ

**دەسکوژ** / deskuj/: ئاوەڵناو. دەستکوژ؛ بە دەست کوژراو ‹تا موعەییەن بێ کە زۆرن دەسگری و

دەسکوژی/ فەرقی سەر، پەنجەی بە خوێناوی حەنا ڕەنگین دەکا «نالی»› ▬ کُشته شده با دست

**دەسکوسندۆڵ** / des(i)k û sindoł/: ناو. چالک؛ دینگی چەڵتووک کوتان ▬ دنگ

**دەسکە**[1] / deske/: ☜ **دەسك**

**دەسکە** [2]: پێشەوشە. دەستە؛ کۆمەڵە ‹دەسکەداو؛ دەسکەگوڵ› ▬ دسته ـ

**دەسکەخەنجەر** / deskexencer/: ناو. قەفت؛ دەسکێ لە گوڵ و گیا ▬ دستەی گُل یا گیاه

**دەسکەداس** / deskedas/: ناو. کەرگەداس؛ کلکەداس ▬ دستەی داس

**دەسکەداو** / deskedaw/: ناو. کۆمەڵێ داموسکی بادراو بۆ ڕاوەکەو ▬ دستەای از دام شکار کبک

**دەسکەرەوە** / deskerewe/: ئاوەڵناو. ئازا و ڕەشید لە شەڕدا ▬ جنگاور

**دەسکەڕن** / deskeřin/: ☜ **دەسکەنە**

**دەسکەڕەشمە** / deskeřeşme/: ناو. هەوساری ئەسپ ▬ افسار اسب

**دەسکەڕیشمە** / deskeřîşme/: ☜ **دەسکەڕیشمە**

**دەسکەڕێشمە** / deskeřêşme/: ناو. دەسکەڕیشمە؛ زگیر؛ هەوسار ▬ افسار

**دەسکەفت** / deskeft/: ☜ **دەسکەوت**

**دەسکەگوڵ** / deskegul/: ناو. ١. چەپکە گوڵ ٢. *[پلار]* کارێکی نالەبار ‹ئەمەش دەسکەگوڵی ئەمڕۆت!› ▬ ١و٢. دستەگل

**دەسکەڵلە** / deskelle/: ناو. ڕەشمە؛ هەوسارۆکەیەک کە دە سەر کەللە دەخرێ ▬ افسار باریک

**دەسکەلۆجە** / deskełûce/: ناو. ئامرازێک لە خەرەکدا ▬ دستگیرەی دوک پنبەریسی

**دەسکەم** / deskem/: ئاوەڵکار. دەستی کەم؛ لانی کەم؛ بە لانی کەمەوە ▬ دستِ کم

**دەسکەنک** / deskenik/: ☜ **دەسکەنە**

**دەسکەنە** / deskene/: ناو. دەسکەڕن؛ دەسکەنک؛ کاری ڕنینەوەی داهاتی کشتوکاڵ بە دەست (بەتایبەت هی نۆک) ▬ درو با دست

**دەسکەوان** / deskewan/: ☜ **دەسکاونگ**

**دەسکەوت** / deskewt/: ناو. دەستکەوت؛ دەسکەفت؛ دەسهات؛ یاب؛ بەرهەم؛ ئەوەی بە بۆنەی کار یا چالاکییەکەوە بە دەست دێ ‹ئەم شەڕە هیچ دەسکەوتێکی نەبوو، بێجگە وێرانی و ئاوارەیی› ▬ دستاورد

**دەسکەوسار** / deskewsar/: ناو. دەسەوسار؛ دەستەجڵەو؛ هەوسار ▬ افسار

**دەسکیس** / deskîs/: ناو. شووفاری دز. هەروەها: دەسکیسی ▬ جاسوس دزدان

**دەسکێش** / deskêş/: ناو. ١. لەپک؛ دەستکێش؛ دەستەوانە؛ لاپک؛ لەپێک؛ تەتک؛ دەستگۆرک؛ پۆشەنی دەست ٢. چاوساغی کوێر ▬ ١. دستکش ٢. عصاکش

**دەسگ** / des(i)g/: ناو. دەسک؛ دەستەی ئامراز ▬ دستەی لوازم و ابزار

**دەسگا** / desga/: ☜ **دەزگا**

**دەسگر** / desgir/: ناو. ١. ☜ **دەزگیران** ٢. ☜ **دەزگیر** ٣. وردەواڵەی چەرچی ▬ ١. ☜ **دەزگیران** ٢. ☜ **دەزگیر** ٣. کالای پیلەور

**دەسگرۆ** / desg(i)ro/: ☜ **دەسگیرۆ**

**دەسگرۆیی** / desg(i)royî/: ☜ **دەسگیرۆیی**

**دەسگوشاد** / desguşad/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دڵاوا؛ دەهندە ▬ سخاوتمند

**دەسگۆڕ** / desgoř/: ئاوەڵکار. دەسەنقەس؛ لەقەست ▬ عمداً

**دەسگووش** / desgûş/: ئاوەڵناو. دەستگووشراو؛ گووشراو یان ئاوگیراو بە دەست ▬ دستافشار

**دەسگەوج** / desgewc/: ☜ **دەستکوێر**

**دەسگیر**[1] / desgîr/: ☜ **دەستگیر**[1]

**دەسگیر**[٢] / desgîr/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **دەستگیر**[٢] ٢. بەردەس‌گر؛ هۆی بەرگری لە جوولە یا چالاکی ‹کارێکی دەسگیرە› ≡ دستوپاگیر

⊡ **دەسگیر بوون**: قۆڵبەس کران؛ گیران. هەروەها: **دەسگیر کردن؛ دەسگیر کران** ≡ دستگیر شدن

**دەسگیران** / desgîran/: ☜ **دەزگیران**

**دەسگیرۆ**[١] / desgîro/: ناو. دەسگرۆ؛ دەزگیران ≡ نامزد

**دەسگیرۆ**[٢]: ئاوەڵناو. دەسگرۆ؛ یاریدەدەر ≡ کمک‌کننده

**دەسگیرۆیی** / desgîroyî/: ناو. دەزگیرۆیی؛ دەزگیری؛ دەسگیری؛ دەسگرۆیی؛ دەستگرۆیی؛ یاریدەی مالی ≡ کمک مالی

**دەسگیرە** / desgîre/: ☜ **دەستەگیرە ـ٢**

**دەسگیری** / desgîrî/: ☜ **دەسگیرۆیی**

**دەس‌ماچان** / desmaçan/: ☜ **دەس‌ڕاموسی**

**دەس‌ماچکەر** / desmaçker/: ☜ **دەس‌ڕاموس**

**دەس‌ماچکەری** / desmaçkerî/: ☜ **دەس‌ڕاموسی**

**دەسماڵ**[١] / desmał/: ناو. ١. دەسرۆک؛ دەسرە ٢. لەچک و سەرپۆشی ژنان ٣. پێچ و مێزەر ≡ ١. دستمال ٢. روسری ٣. دستار

**دەسماڵکاغەزی** / desmałkağezî/: ناو. دەسرەی کاغەزی؛ دەسرەی لە کاغەزی لۆکە بۆ یەکجار سڕین ≡ دستمال‌کاغذی

**دەسماڵە** / desmałe/: ناو. لەپک؛ دەسکێشی دەست ≡ دستکش

**دەسمایە** / desmaye/: ناو. دەزمایە؛ دەستمایە؛ سەرمایە ≡ سرمایە

**دەسمایەدار** / desmayedar/: ئاوەڵناو. دەزمایەدار؛ دەستمایەدار؛ دەولەمەند ≡ سرمایەدار

**دەسمز** / desmiz/: ناو. دەستمز: ١. مزەی کار ٢. /پلار/ بەشی دەلال ≡ ١. دستمزد ٢. مُزد دلال

**دەس‌مەرێزانە** / desmerêzane/: ☜ **دەسخۆشانە**

**دەسمەلە** / desmele/: ناو. مەلەباسکە؛ سۆبایی بەدەستان ≡ شنای کرال

**دەسمیز** / desmîz/: ☜ **دەسپەڕ**

**دەسمییەت** / desmîyet/: ناو. یارمەتی ‹مەمنوونم لەی کارە دەسمییەتم دان› ≡ کمک

**دەسمێ** / desmê/: ☜ **دەسنوێژ**

**دەسمێژ** / desmêj/: ☜ **دەسنوێژ**

**دەسندە** / desinde/: ☜ **دەستندە**

**دەسندەخۆر** / desindexor/: ☜ **دەستندەخۆر**

**دەسنگە** / desinge/: ☜ **دەستندە**

**دەسنویس** / desn(i)wîs/: ☜ **دەست‌نووس**

**دەسنوێژ** / desn(i)wêj/: ناو. /ئیسلام/ دەزنوێژ؛ دەسمێ؛ دەسمێژ؛ دەسنۆژ؛ دەستنوێژ؛ دەستنمێژ؛ دەس‌ودیم ≡ وضو

⊡ **دەسنوێژ شکان**: ١. /ئیسلام/ هەڵوەشانەوەی دەسنوێژ ٢. /کینایە/ با لێ‌بەر بوون ≡ ١. باطل شدن وضو ٢. باد شکم خالی شدن

**دەسنوێژ گرتن/ شتن/ شۆردن**: /ئیسلام/ بەجێ‌هێنانی ئایینی تایبەتی شۆردنی سەر و دەست و پێ و خۆ خاوێن کردنەوە، پێش دابەستنی نوێژ ≡ وضو گرفتن

**لە کەسێک دەسنوێژ شکان**: /ئیسلام/ نامەحرەم بوون بە کەسێک ≡ نامحرم بودن با کسی

**دەسنۆژ** / desnoj/: ☜ **دەسنوێژ**

**دەسنووس** / desnûs/: ☜ **دەست‌نووس**

**دەس‌نەخشین** / desnexşîn/: ☜ **دەس‌ڕەنگین**

**دەس‌نەخواردوو** / desnex(i)wardû/: ئاوەڵناو. ئاکبەند؛ دەست‌لێ‌نەدراو ≡ دست‌نخوردە

**دەس‌نەوێساو** / desnewêsaw/: ئاوەڵناو. /پلار/ تەورلەق؛ سەرعەرز ≡ بی‌تربیت

**دەسنیا** / desn(i)ya/: ئاوەڵناو. داسەپاو؛ داسپاردە؛ خاوەن پیشە یان پلە و پایەیەک کە لە لایەن کەسی ترەوە دانراوە و گوێڕایەڵی ئەوە ‹تەنیا

دەسنیای خۆیان دادەمەزرێنن› 🇮🇷 دست‌نشانده

**دەس‌نیشان** / desnîşan/: ☜ **دەست‌نیشان**

**دەسواز** / deswaz/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* دڵاوا 🇮🇷 بخشنده

**دەسوان‌دەس** / deswandes/: ☜ **دەساودەس**[٣]

**دەس‌وبرد** / des û bird/: ☜ **دەست‌وبرد**

**دەس‌وبۆس** / des û bos/: ناو. کاری یەکتر ماچ کردن 🇮🇷 روبوسی

**دەس‌وپا** / des û pa/: ناو. *[کینایە]* نۆکەر و کارەکەر 🇮🇷 کلفت و نوکر

**دەس‌وپل** / des û pil/: ناو. ١. دەست و پەنجە ٢. دەست و دەم‌وچاو 🇮🇷 ١. دست و انگشتان ٢. دست و صورت

**دەس‌وپەیمان** / des û peyman/: ناو. *[پەلار]* دەست‌وپێ؛ نۆکەر و کارەکەر 🇮🇷 خدم و حشم

**دەس‌وتفەنگ** / des û tfeng/: ناو. دەس‌ونیشان؛ لێهاتوویی لە تیرهاویشتن 🇮🇷 مهارت در تیراندازی

**دەس‌وخەت** / des û xet/: ☜ **دەست‌وخەت**

**دەس‌ودیم** / des û dîm/: ☜ **دەسوێژ**

**دەس‌وڕی** / des û ȓî/: ناو. دەست و ڕوو؛ دەست و دەم و چاو 🇮🇷 دست و صورت

**دەسوشک** / deswişk/: ئاوەڵناو. *[پەلار]* ڕژد؛ چرووک 🇮🇷 خسیس

**دەس‌وفەرمان** / des û ferman/: ناو. دەساژۆ؛ لێهاتوویی لە شۆفێری 🇮🇷 مهارت در رانندگی

**دەس‌وکار** / des û kar/: ناو. دەسکار؛ کاری دەستی 🇮🇷 کاردستی

**دەس‌ومشتاق** / des û miştaq/: ☜ **دەست‌ومشتاق**

**دەس‌ومۆچ** / des û moç/: ☜ **دەست‌ومشتاق**

**دەسوەسینە** / deswesîne/: ☜ **دەست‌بەسینە**

**دەسوەشانە** / desweşane/: ☜ **دەسخۆشانە**

**دەسوەشێن** / desweşên/: ☜ **دەست‌وەشێن**

**دەسوەن** / deswen/: ناو. دەستبەند 🇮🇷 دستبند

**دەسۆک** / desok/: ☜ **دەسڕۆك**

**دەسوور** / desûr/: ☜ **دەستوور**[١]

**دەسە** / dese/: ناو. ١. ☜ **دەستە**[١] ٢. دەست؛ دەس (جل‌وبەرگ و ...) 🇮🇷 ١. ☜ **دەستە**[١] ٢. دست (لباس و ..)

▣ **دەسە کردن**: ١. بە دەسک بەستن؛ دەسک کردن ٢. تەکووز کردن 🇮🇷 ١. دسته کردن ٢. مُرتب کردن

**دەسەبرا** / deseb(i)ra/: ☜ **دەستەبرا**

**دەسەبوخچە** / desebuxçe/: ☜ **دەستەبوخچە**

**دەسەبەر** / deseber/: ☜ **دەستەبەر**

**دەسەبەنی** / desebenî/: ☜ **دەستەبەندی**

**دەسەپاچە** / desepaçe/: ☜ **دەستەپاچە**

**دەسەپارچە** / deseparçe/: ☜ **دەستەپاچە**

**دەسەپێچک** / desepêçik/: ☜ **دەسپێچك**

**دەسەجڵەو** / desec(i)łew/: ☜ **دەستەجڵەو**

**دەسەچرا** / deseç(i)ra/: ناو. فتیلە؛ قوتیلکە؛ قودیلەچرا 🇮🇷 چراغ موشی

**دەسەچەک** / deseçek/: ☜ **دەستەچەك**

**دەسەچیلە** / deseçîle/: ☜ **دەستەچیلە**

**دەسەچینە** / deseçîne/: ناو. تریان؛ قەرتاڵە؛ سەوەتە 🇮🇷 سبد

**دەسەخلافکێ** / desex(i)łafkê/: ناو. خڕخاڵەی لانک؛ بازنەی داریـن بە داری بێشکەوە بۆ خلافیانی منداڵ 🇮🇷 حلقه‌های گهواره برای سرگرمی کودک

**دەسەخوشک** / desexuşk/: ☜ **دەستەخوشك**

**دەسەداس** / desedas/: ناو. تەوراس؛ تەرداس؛ تەورداس 🇮🇷 داس شاخه‌بُری

**دەسەداو** / desedaw/: ☜ **دەستەداو**

**دەسەدوو** / desedû/: ☜ **دەستەدوو**[٢]

**دەسەدیار** / desed(i)yar/: ☜ **دەستەڕیقانە**

**دەسەدیاری** / desed(i)yarî/: ☜ **دەستەڕیقانە**

**دەسەر** / deser/: ناو. ١. ☜ **دەسار** ٢. ☜

**دەسرۆك**

**دەسەژەن / desejen/**: ناو. دەسەژەنە؛ دەسەلقوت؛ داری دەزگیرەی مەشکە 🇮🇷 چوب دستگیرەی مشک

**دەسەژەنە / desejene/**: ☜ **دەسەژەن**

**دەسەسڕ / desesiř/**: ناو. دەستسڕ؛ دەستەسڕ؛ دەسرەی دەست؛ دەسماڵ 🇮🇷 دستمال

**دەسەسەر / deseser/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ١. سەرگەردان؛ گێژ و مات ٢. خەفەتبار؛ خەمبار 🇮🇷 ١. سرگردان ٢. غمگین

⊡ **دەسەسەر بوون**: *[مەجاز]* دەرکران؛ بە شێوەیەک لە کۆڵەوە بوون. هەروەها: **دەسەسەر کردن** 🇮🇷 دستبەسر شدن

**ناردن بۆ دەسەسەرگە**: *[مەجاز]* بۆ لە کۆڵ کردنەوەی کەسێ، ناردنی بەشوێن شتێکی ناڕوون و نەشیاودا 🇮🇷 دنبال نخودسیاه فرستادن

**دەسەشکێن / deseş(i)kên/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* هەڵخەڵەتاو؛ فێڵ لێ کراو 🇮🇷 فریب‌خوردە

**دەسەک[1] / desek/**: ☜ **دەستەك**

**ـ دەسەک[2]**: پاشەوشە. دەستە؛ دۆست و یاوەر ‹دزدەسەک› 🇮🇷 ـ یار

**دەسەکەوشە / desekewşe/**: ناو. دەزگرەی جووتێر لە هەوجاڕ 🇮🇷 دستگیرەی خیش

**دەسەگوڵ / deseguł/**: ناو. دەستەگوڵ؛ چەپکەگوڵ 🇮🇷 دستە گل

**دەسەگیرە / desegîre/**: ☜ **دەستگرە[1]**

**دەسەلقوت / deselqut/**: ☜ **دەسەژەن**

**دەسەڵات / desełat/**: ناو. دەستەڵات: ١. چۆنیەتی دەست ڕۆیشتن ‹ڕۆژێک گوتی: دەترسم لە ماڵە من بتگرن، دەسەڵاتم نییە ڕزگارت کەم و ئابڕووم دەچێ! «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. *[ڕامیاری]* هێزی پەسندکراوی فەرمی ‹دەگەڵ تێکچوونی دەسەڵاتی دەوڵەت لە موکریان، قازی ... دەسەڵاتی سابلاغی تەواو لە دەستا بوو «هەژار، چێشتی مجێور»› ٣. ویست؛ ئیختیار؛ ئیرادە ‹لە بیرم نییە من وام گوتبێ، بە غەڵەتیان نووسیوە، بەڵام دەسەڵات چییە؟! «هەژار، چێشتی مجێور»› 🇮🇷 ١. نفوذ ٢. قدرت ٣. اختیار

**دەسەڵاتدار / desełatdar/**: ئاوەڵناو. دەستەڵاتدار: ١. دەس‌ڕۆیشتوو ٢. *[ڕامیاری]* خاوەن دەسەڵات ‹ئەی دەسەڵاتدار، دەست ناگاتە تۆ/ ئەی پەروەردگار، هانای گشت بە تۆ «پیرەمێرد»› 🇮🇷 ١. بانفوذ ٢. حاکم

**دەسەڵاتداری / desełatdarî/**: ناو. دەستەڵاتداری: ١. دەس‌ڕۆیشتوویی ٢. *[ڕامیاری]* دەزگای حکوومەت ٣. *[ڕامیاری]* دۆخ یان چۆنیەتی دەسەڵاتدار بوون ‹دەسەڵاتداریی دەستووری› 🇮🇷 ١. استیلا ٢. حاکمیت ٣. حُکمرانی

**دەسەڵاتگە / desełatge/**: ناو. قەڵەمڕەو 🇮🇷 قلمرو

**دەسەڵێن / desełên/**: ئاوەڵناو. دەستەڵێن؛ دەستەمۆ 🇮🇷 رام

**دەسەملان / desem(i)lan/**: ☜ **دەستەملان**

**دەسەملانێ / desem(i)lanê/**: ☜ **دەستەملان**

**دەسەمۆ / desemo/**: ☜ **دەستەمۆ[2]**

**دەسەناز / desenaz/**: ☜ **دەستەنداز**

**دەسەناو / desenaw/**: ☜ **دەستەوناو**

**دەسەنقەس / desenqes/**: ☜ **دەسانقەست**

**دەسەنقەست / desenqest/**: ☜ **دەسانقەست**

**دەسەنە / desene/**: ناو. ئەو شتەی کە بە خۆڕایی بدرێتە کەسێ 🇮🇷 مجانی

**دەسەنەدار / desenedar/**: ئاوەڵناو. دڵاوا؛ دەهندە 🇮🇷 بخشندە

**دەسەوا / desewa/**: ناو. پەلە 🇮🇷 شتاب

⊡ **دەسەوا کردن**: پەلە کردن؛ لەز کردن 🇮🇷 شتاب کردن

**دەسەوار / desewar/**: ☜ **دەستەوارە**

**دەسەوارە / deseware/**: ☜ **دەستەوارە**

**دەسەوام** / desewam/: ☜ دەستەوام

**دەسەوان** / desewan/: ناو. جوون؛ دەس ئاونگ ☰ دستەی هاون

**دەسەوانە** / desewane/: ☜ دەستەوانە

**دەسەوبەسە** / desewbwse/: ☜ دەستەودایرە

**دەسەودەس** / desewdes/: ☜ دەساودەس

**دەسەوسار** / desewsar/: ☜ دەسکەوسار

**دەسەوسان** / desewsan/: ☜ دەستەوستان

**دەسەوملان** / desewm(i)lan/: ☜ دەستەملان

**دەسەوەرە** / desewere/: ☜ دەستەبەرە

**دەسەوەستان** / desewestan/: ئاوەڵناو. زەبوون؛ داماو؛ دەسەپاچە؛ بێدەسەلات ☰ زبون

**دەسەویەخە** / desewyexe/: ☜ دەستەویەخە

**دەسەویەقە** / desewyeqe/: ☜ دەستەویەخە

**دەسەیاو** / deseyaw/: ناو. پەردەژی؛ هەنا؛ دەسڕەسی ☰ دسترسی

⊡ **دەسەیاو پێ گەیین**: توانایی یان لوان بۆ دەست گەییشتن بە کەسێ یا شتێ ‹ئەم پوولە با لە لات بێ من ئیتر دەسەیاوم پێت ناگەیێ› ☰ دسترسی داشتن

**دەسهات** / deshat/: ☜ دەسکەوت

**دەسهاڕ** / deshař/: ☜ دەساڕ

**دەسهاڵی** / deshałî/: ☜ دەستواڵا

**دەسهەڕە** / desheře/: ئاوەڵناو. دەم مشاری (چەقۆ) ☰ تیغە ارّەای (چاقو)

**دەسهەڵبەست** / deshełbest/: ئاوەڵناو. درۆیی؛ هەڵبەست ☰ دروغی؛ ساختگی

**دەسهەڵگر** / deshełgir/: ئاوەڵناو. وازهێن ‹دەسهەڵگری بالات نیم!› ☰ دستبردار

**دەسهەوسار** / deshewsar/: ناو. دەزگین؛ هۆسار ☰ افسار

**دەسی** / desî/: ☜ دەستی

**دەسیار** / desyar/: ناو. دەفری ڕۆن قرچاندن ☰ ظرف روغن داغ کردن

**دەسیاری** / desyarî/: ناو. ١. یارمەتی ٢. کاری دەست تێ بردن ‹ئەم کارە بە دەسیاری تۆ وای لێ هات› ☰ ١. دستیاری ٢. دخالت

**دەسیاو** / desyaw/: ناو. دەستخۆشانە ☰ انعام

**دەسی ـ دەسی** / desî desî/: ☜ دەستی ـ دەستی

⊡ **دەسی ـ دەسی پێ کردن**: تەفرە پێدان و خستنە دواوە ☰ طفره دادن

**دەسینک** / desînik/: ناو. دەزونک؛ دەسینگ؛ بازنە؛ خرخاڵ ☰ النگو

**دەسینگ** / desînig/: ☜ دەسینك

**دەسینە** / desîne/: ناو. بازن؛ بازنە ☰ النگو

**دەسیەر** / desyer/: ☜ دەساڕ

**دەشت** / deşt/: ناو. ١. سفتاح؛ هەوەڵ فرۆشی ڕۆژانە ٢. [کنایە] دەر؛ دەرەوە ٣. دەشتە؛ چۆڵ و دوور لە ئاوایی ٤. زەوینی تەخت ☰ ١. دشت دُکاندار ٢. بیرون ٣. بیابان ۴. زمین هموار

⊡ **دەشت کردن**: سفتاح کردن ‹لە بەیانییەوە دەشتم نەکردووە› ☰ دشت کردن

**چوونە دەشتەوە**: چوونە/ ڕۆیشتنە دەرەوە ☰ بیرون رفتن

**کردنە دەشتەوە**: دەرکردن؛ کردنە دەرەوە ☰ بیرون کردن

**دەشتان**[1] / deştan/: ناو. ١. زەوی گۆڕ؛ زەمینی تەخت ٢. شوێنی بێدار ☰ ١. زمین هموار ٢. جای بیدرخت

**دەشتان**[2]: ئاوەڵناو. بێنوێژ (ژن) ☰ در حیض؛ پریود

**دەشتانی** / deştanî/: ناو. دەشتایی؛ زەمینی گۆڕ و تەخت ☰ زمین هموار

**دەشتایی** / deştayî/: ناو. ١. ☜ دەشتانی ٢. ڕاستی و گۆڕایی زەوی ☰ ١. ☜ دەشتانی ٢. همواری زمین

**دەشتودەر** / deşt û der/: ناو. دەرودەشت: ١.

بیاوان؛ چۆڵایی ٢. سارا؛ پانایی ٣. دەر؛ شوێنی دوور لە ئاوایی ٤. ولات (بە عام) ‹سەحرا و دەشت‌ودەر بەهەشت مەنمانۆ/ مۆرەی هەوای وەش وە شەشدەر شانۆ «مەولەوی»› ▪ ١. در و دشت؛ صحرا ٢. بیابان ٣. بیرون آبادی ۴. ولایت (در مفهوم عام)

**دەشتە / deşte/:** ☞ **دەشت ـ٣**

**دەشتەکی / deştekî/:** ئاوەڵناو. دەشتی: ١. لادێیی؛ لاگیەیی ‹پیاوی سادە و دەشتەکی، دەسەڵاتداران زۆر لەوە زیاتر دەبینن کە هەن «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. چۆڵنشین ‹بیست فەعلەیەکی عەرەبی دەشتەکیم تەسلیم کرا و دەسمان بە کار کرد «هەژار، چێشتی مجێور»› ٣. خۆکرد؛ خۆڕست ‹هەرمێی دەشتەکی› ٤. *[پلار]* ئەیاغ؛ کەم‌نرخ ▪ ١. دهاتی ٢. بیابان‌نشین ٣. طبیعی ۴. بُنجل

**دەشتەوان / deştewan/:** ناو. ١. کەسێ کە کاری لە دەری ئاوەدانییە ٢. کەسێ کە ئاگادری دەشت و مەزرای گوندێک یان بەشێکیە ▪ ١و٢. دشتبان

**دەشتەوانی / deştewanî/:** ناو. چۆڵەوانی؛ کار و ڕەوتی ئاگادار بوون لە دەشت و سارا ▪ دشتبانی

**دەشتی[1] / deştî/:** ناو. لە ئاوازە ئێرانییەکان لە دەستگای شووردا، کە بارێکی خەمین و ناسکی هەیە ▪ آهنگ دشتی

**دەشتی[2]:** ☞ **دەشتەکی**

**دەشقەم / deşqem/:** ئاوەڵکار. دەشکەم؛ بەشکوو؛ بەشکەم ▪ بلکه

**دەشکە / deşke/:** ناو. دەزووی دروومان ▪ نخ دوخت‌ودوز

**دەشکەم / deşkem/:** ☞ **دەشقەم**

**دەشنە / deşne/:** ناو. قیمەکێش ▪ کارد قصابی

**دەشۆ[1] / deşo/:** ناو. *[پلار]* ئاوی شت پێ شوتن ▪ آب شستشو

**دەشۆ[2]:** ئاوەڵناو. *[پلار]* دەفشۆ؛ زمان‌شڕ؛ دەم‌نەوەستاو؛ قسەپەڕێن ▪ دهن‌لق

**دەشە / deşe/:** ئاوەڵناو. دیمەن‌جوان؛ بەدیمەن ▪ خوش‌منظر

**دەشەنی / deşenî/:** ئاوەڵناو. ناهەقی‌لێکراو؛ مەزڵووم ▪ مظلوم

**دەشەنین / deşenîn/:** چاوگ. بەلەز ڕۆیشتن ▪ شتافتن

**دەشێ / deşê/:** ☞ **ئەشێ**

**دەعبا / de'ba/:** ناو. داحبا؛ دەحبە؛ داعبا؛ دەهبە: ١. جانەوەری دڕندە ٢. *[مەجاز]* هەر بوونەوەرێکی سەیر و سەمەرە کە نەناسرابێ ٣. مێروو ▪ ١. درّنده ٢. حیوان شناخته نشده ٣. حشره

**دەعجانی / de'canî/:** ☞ **دەعەجانی**

**دەعوا / de'wa/:** ناو. ١. خواست؛ داوا ‹ئەگەر خەنجەر! بە خەنجەر پارەپارەت کەن لەسەر دەعوات/ نەڵێی ئۆف! هەر بڵێ ئۆخەی، کەوا ئاواتەکەم پێکهات «قانع»› ٢. شەڕ و کێشە ▪ ١. طلب ٢. کشمکش

**دەعوەت / de'wet/:** ناو. بانگێشت؛ بانگهێشت ▪ دعوت

**دەعوەتکراو / de'wetk(i)raw/:** ئاوەڵناو. بانگێشتن‌کراو ▪ دعوت شده

**دەعوەتی[1] / de'wetî/:** ناو. میوانی؛ مێمانی؛ میرڤانی؛ ڕێوڕەسمی بانگهێشتن و پەزیرایی لە میوان ▪ مهمانی

**دەعوەتی[2]:** ئاوەڵناو. دەعوەت‌کراو؛ بانگ‌کراو بۆ میوانی ▪ دعوت شده

**دەعەجانی / de'ecanî/:** ئاوەڵناو. دەعجانی؛ ناشیرین؛ زۆر ناحەز ‹کچەتیوی دەعەجانی خۆی بریوەتە مل کوڕەکەمدا!› ▪ زشترو

**دەعیە / de'ye/:** ناو. دەحیە؛ دەمار؛ فیز؛ دۆخی لە خۆ بایی بوون ▪ تکبر

**دەغ / değ/:** ئاوەڵناو. بوور؛ بەیار؛ نەچێندراو ▪ بایر

**دەغا[1] / değa/:** ناو. ئاژاڵ؛ زۆڵەک؛ دەنکی بێگانە لە

ناو دەغڵدا ‹ئەم گەنمە دەغای زۆرە› 🇮🇷 نُخاله

**دەغا**[٢]: ئاوەڵناو. بیژوو؛ بیچ؛ زۆڵ 🇮🇷 حرامزاده

**دەغالەت / değalet/**: ناو. دەخالەت: ١. ڕەوتی خۆ بە دەستەوە دان ٢. ڕەوتی پەنا بردن 🇮🇷 ١. تسلیم ٢. پناه

**دەغل / değ(i)l/**: ناو. خەلە؛ غەلە؛ دانەوێڵە؛ دەخل 🇮🇷 غلّه

**دەغڵ / değł/**: ناو. دەخڵ؛ خەلە؛ غەلە؛ خەلیە؛ دان؛ هەب؛ داناش؛ دانەوێر؛ دانهێرک؛ دخلەدان؛ ناوی گشتی بۆ دەنک و دانی گیاگەلی تیرەی گەنم (وەک: گەنم، جۆ، برنج، هەرزن، گەنمەشامی و ...) 🇮🇷 غلّه

⊡ **دەغڵ کردن**: ١. خەلە چاندن ٢. خۆ تێگەیاندن 🇮🇷 ١. غلّه کاشتن ٢. دخالت کردن

**دەغڵودان / değł û dan/**: ناو. خەلە و خەرمان؛ دەخڵ و دانەوێڵە 🇮🇷 بهرەی غلات

**دەغمە / değme/**: ☜ دەخمە

**دەغووڵ / değûł/**: ئاوەڵناو. دەغەڵ؛ فێڵباز؛ گزیکار؛ دەسبڕ 🇮🇷 حُقەباز

**دەغەز / değez/**: ☜ دەخس[١]

**دەغەزار / değezar/**: ☜ دەغەزدار

**دەغەزدار / değezdar/**: ئاوەڵناو. دەغەزار؛ نەخۆش: ١. گیرۆدەی ئافەت ٢. *[کینایە]* تووشیاری نەخۆشی دەروونی 🇮🇷 ١. بیمار ٢. بیمار روانی

**دەغەڵ**[١] **/ değeł/**: ناو. دەغا؛ دانە و گیای بێگانە لە ناو دەغڵدا 🇮🇷 دانه و گیاه هرزه در کشتزار

**دەغەڵ**[٢]: ئاوەڵناو. دەغووڵ؛ فێڵباز 🇮🇷 دَغل

**دەغەڵباز / değełbaz/**: ئاوەڵناو. دەغەڵکار؛ دەغووڵ؛ فێڵباز 🇮🇷 دغلباز

**دەغەڵکار / değełkar/**: ☜ دەغەڵباز

**دەغەڵە / değełe/**: ناو. دەنکی بێگانە لە ناو گەنم و برنجدا 🇮🇷 نُخالەی گندم و برنج

**دەغەڵی / değełî/**: ناو. ناڕاستی؛ فێڵبازی 🇮🇷 نادرستی؛ حُقەبازی

**دەغیل**[١] **/ değîl/**: ئاوەڵناو. ١. پەنابەر ٢. تەسلیمبوو لە شەڕدا ‹باس لە ترس و دەغیل بوونی خۆی دەکا› 🇮🇷 ١. پناهنده ٢. تسلیم شده در جنگ

**دەغیل**[٢]: ☜ **دەغیلە**[٢]

**دەغیلە**[١] **/ değîle/**: ناو. دەخیلە: ١. داخڵەی پارەی دووکاندار ٢. دەخیلە؛ قولەک؛ سندووقێکی چکۆلە کە بەتایبەت منداڵان پارەی تێدا کۆ دەکەنەوە ٣. دەغەڵە؛ دەنکی بێگانە لە ناو گەنم و برنجدا 🇮🇷 ١. دخل مغازه ٢. قُلک ٣. نُخاله

**دەغیلە**[٢]: دوعا. دەخیل؛ دەغیل؛ وشەی پاڕانەوە 🇮🇷 زنهار

**دەف**[١] **/ def/**: ناو. ١. دەفە؛ دەفک؛ ئامێرێکی مووسیقایی لە پێستی بە سەر کەمەدا کێشراو ٢. لەز؛ پەلە ٣. هەناسە؛ پشوو؛ بینگ 🇮🇷 ١. دف ٢. شتاب ٣. نفس

⊡ **دەف دان**: پشوو سوار بوون؛ دڵ توند لێدان ‹هێندە ماندووە هەر دەفان دەدا› 🇮🇷 بە نفس نفس افتادن

**دەف ژەندن**: دەف لێدان 🇮🇷 دف زدن

**دەفی کەسێک دەنگ نەدان**: *[کینایە]* ١. برەو نەمانی قسەی کەسێک ٢. ساز نەبوون؛ وەڕەز بوون 🇮🇷 ١. سخن کسی خریدار نداشتن ٢. سرحال نبودن

**دەف**[٢]: ئامراز. لە لا؛ نزیک؛ جەم؛ کن؛ نک 🇮🇷 نزدِ؛ پیشِ

**دەفتەر / defter/**: ناو. ١. پەڕاو؛ تینووس؛ پەڕاوی؛ دەستەیەک کاغەزی سپی پێکەوە لکاو یان دووراو کە بۆ نووسین بە کار دێ ٢. نووسینگە؛ نڤیسنگە؛ مەکتەب؛ جێگایەک (بریتی لە یەک یان چەند ژوورە) کە دەوێدا کاری بازرگانی و مەزرینگەیی دەکرێ ٣. نووسینگە؛ نڤیسخانە؛ یازخانە؛ دەفتەرخانە؛ دیوی نووسینی بە کۆمەڵ؛ بەشێ لە دامەزراوە یان مەزرینگە کە کار و باری

نامە نووسین و هەناردن و وەرگرتنی نامە جێبەجێ دەکا ٣ ۱تا۳. دفتر

▣ **دەفتەری کۆن خوێندنەوە:** /کنایە/ کای کۆنە وە با دان؛ شتی کۆن وەبیر هێنانەوە ٣ گذشته را بە یاد آوردن

**دەفتەرخانە** / defterxane/: ناو. ۱. مەزرینگەی کارگێڕی میری ۲. شوێنی تۆمار کردنی بەڵگەی جۆراوجۆر ٣ ۱. دبیرخانە ۲. دفترخانە

**دەفتەردار** / defterdar/: ناو. ۱. کەسێ کە بەرپرسی نووسین، ڕێک‌وپێک کردن و ئاگاداری لە دەفتەرگەلی دامەزراوەیەکە ۲. سەردەفتەر؛ بەڕێوەبەر یان خاوەنی نووسینگە ٣ ۱و۲. دفتردار

**دەفتەری** / defterî/: ئاوەڵناو. پێوەندیدار بە دەفتەرەوە ٣ دفتری

**دەفحە** / defĥe/: ناو. جار؛ چەل؛ دەحفە ٣ دفعە

**دەفدەفینک** / defdefînik/: ناو. دەفدەفێکە؛ دەڤ‌فینکە؛ دەڤ‌فیکە؛ دووزەلەمەشکە؛ بلوێر و زوڕنایێ کە فووی لە هەنبانەوە دەدەنێ ٣ نی‌انبان

**دەفدەفێکە** / defdefêke/: ☜ دەفدەفینك

**دەفر** / defr/: ناو. فۆڵوفەرە؛ فەرەوفۆڵ؛ ئامان؛ قاپوقاچاغ؛ هەوەڕ؛ ئیربار؛ هیربار؛ زەرف؛ حاجەت؛ ئامرازی قووڵ یان هلۆڵ بۆ کولاندن و لێنان و نان خواردن (وەک قاولەمە، بایە، دەوری و...) ٣ ظرف

**دەفرایەتی** / defrayetî/: ناو. گونج؛ توانایی جێ بوونەوە ٣ گُنجایش؛ ظرفیت

**دەفرشۆر** / def(i)rşor/: ناو. کاسەشۆر؛ زرووە ٣ اسکاچ

**دەفرە** / defre/: ناو. زۆرەبانی؛ زۆران؛ ملانێ ٣ کُشتی

**دەفزک** / defzik/: ☜ دەفزگ

**دەفزگ** / defzig/: ئاوەڵناو. /پلار/ دەفزک؛ دەفەزکە؛ زگ‌زل؛ ورگ‌زل ٣ شکم‌گندە

**دەفزەن** / defzen/: ☜ دەفژەن

**دەفژەن** / defjen/: ناو. دەفزەن؛ دەفەلێدەر؛ کەسێ کە دەف ئەژەنێ ٣ دفزن

**دەفعاندن** / def'andin/: چاوگ. پاڵ پێوە نان؛ بۆق پێوە نان ٣ هُل دادن

**دەفک** / defik/: ناو. ۱. دەف ۲. سەروسیما؛ دەموچاو ٣ ۱. دف ۲. چهرە

**دەفگەم** / defgem/: ناو. دانەلغاو ٣ دهنەی لگام

**دەفن** / def(i)n/: ناو. ۱. کەپۆ؛ لووت؛ بێڤل؛ دم؛ تفنک ۲. خاک‌سپێری؛ کار و ڕەوتی ناشتن؛ ناژتن؛ تەمراندن ٣ ۱. بینی ۲. دفن

**دەفە** / defe/: ناو. ۱. دەف ۲. پانایی سنگ و ناوشان ۳. شەپیلک؛ پاڕۆ؛ کەلەکوچ؛ ئێسکێکی گەورەی پان و سێ‌سووچە لە پشتدا ئێسکی باسک ڕادەگرێ ٤. هەپە؛ هەپک؛ ئامرازی کوتانی پۆی فەرش لە تەوندا ٣ ۱. دف ۲. پهنای سینە و کتف ۳. کتف ۴. شانەی پودکوبی در فرشبافی

**دەفەزکە** / defez(i)ke/: ☜ دەفزگ

**دەفەلێدەر** / defelêder/: ☜ دەفژەن

**دەفیلە** / defîle/: ناو. سان؛ ڕێژە ٣ سان

**دەفین** / defîn/: چاوگ. دەمین؛ فوو دان؛ پف کردن؛ دەڤ دان ٣ دمیدن

**دەڤ**[1] / dev/: ناو. دەم؛ زار (سەفەرا شام و عیراقێ ل مە خوەش لازم و فەر کر/ ب مەدا ژەهر و ڕەقیبان د دەڤێ شەهد و شەکەر کر «مەلای جزیری») ٣ دهان

▣ **دەڤ ناویتن:** بە درۆ خۆ هەڵکێشان ٣ لاف زدن

**دەڤ دان:** ۱. فوو کردن ۲. فوو بە بلوێر و شمشاڵ و ...دا کردن ٣ ۱. پُف کردن ۲. دمیدن در ساز

**دەڤ**[2]: ئامراز. لە کن؛ لا؛ لنک؛ جەم ٣ کنارِ

**دەڤار** / devar/: ☜ دەوار

**دەڤبخوون** / devb(i)xûn/: ئاوەڵناو. خوێنمژ ٣

خونخوار

**دەڤبدەڤ / devb(i)dev/**: ئاوەڵکار. زاربەزار؛ دەماودەم ☰ دهن به دهن

**دەڤبگۆتن / devb(i)gotin/**: ناو. پەیمانڕاگر؛ بەڵێندار ☰ درست‌پیمان

**دەڤبەردا / devberda/**: ئاوەڵناو. *[پلار]* زارشڕ؛ تێدانەوەستاو ☰ دهن‌لق

**دەڤبەش / devbeş/**: ئاوەڵناو. بەتەماح؛ چاوبرسی ☰ آزمند

**دەڤبێنک / devbênik/**: ناو. ١. دەمبێن؛ زاربێن؛ تۆپەوانە ٢. دمبەندی حەیوان ☰ ١. دهانەبند ٢. پوزەبند

**دەڤپیس / devpîs/**: ئاوەڵناو. *[پلار]* جوێن‌فرۆش؛ زمان‌پیس ☰ بددهن

**دەڤتووک / devtûk/**: ئاوەڵناو. کەفچەڕێن؛ دۆخی کەسێ کە لە تووڕەبووندا کەف لە دەمی دەچرێنێ ☰ کف به دهان (از خشم)

**دەڤچەنگ / devçeng/**: ناو. وتووێژ ☰ گفتگو

**دەڤچێر / devçêr/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دژوون‌دەر؛ جوێن‌فرۆش ☰ بددهن

**دەڤحلوی / devĥilwî/**: ☜ دەڤهلو

**دەڤخار / devxar/**: ئاوەڵناو. ١. زارخوار؛ کەوچ ٢. *[مەجاز]* درۆزن ٣. *[مەجاز]* گەوج ☰ ١. دهان‌کج ٢. دروغگو ٣. ابله

**دەڤخۆر / devxor/**: ناو. تابشت؛ تاقەت؛ توان ☰ توانایی

**دەڤخۆش / devxoş/**: ئاوەڵناو. ڕاوێژخۆش؛ قسەخۆش ☰ شیرین‌سخن

**دەڤدرێژ / devd(i)rêj/**: ئاوەڵناو. *[پلار]* زمان‌درێژ؛ چەنەوەر ☰ پُرچانه

**دەڤدریا / devdiřya/**: ئاوەڵناو. *[پلار]* زۆربلێ ☰ رودەدراز

**دەڤدەڤانێ / devdevanê/**: ناو. کێشە؛ دەمەقاڵە ☰ جدل

**دەڤڕاست / devřast/**: ☜ دەمڕاست

**دەڤژەنگ / devjeng/**: ☜ دەمەقرە

**دەڤسڤک / devs(i)vik/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* بە پەلە لە گوتن و خواردندا ☰ عجول در حرف زدن و خوردن

**دەڤشۆ[1] / devşo/**: ناو. *[پلار]* ١. بەرماوی خواردن کە دەدرێ بە سەگ و پشیلە و ئاژەڵ ٢. ئاوی دەفر شوتن ☰ ١. پسماندەی خوراک کە بە حیوان می‌دهند ٢. آب ظرفشویی

**دەڤشۆ[2]**: ئاوەڵناو. *[پلار]* زمان‌شڕ؛ تێدانەوەستاو ☰ دهن‌لق

**دەڤشەوتی / devşewtî/**: ناو. چنگسووتەکە؛ چێشتێکە ☰ آشی است

**دەڤفیکە / devfîke/**: ☜ دەفدەفینك

**دەڤفینکە / devfînke/**: ☜ دەفدەفینك

**دەڤکلیز / devk(i)lîz/**: ئاوەڵناو. دەمبەلیکاو ☰ لعاب بر دهان

**دەڤکەن / devken/**: ناو. زەردەخەنە ☰ لبخند

**دەڤکەنۆک / devkenok/**: ئاوەڵناو. هەمیشە ڕووخۆش ☰ خندەرو

**دەڤکی / devkî/**: ئاوەڵناو. زارەکی؛ دەمی؛ زمانی؛ زوانی؛ بە تایبەتمەندی ئەوەی کە بە زمان دەردەبڕدرێ و نانووسرێ ☰ شفاهی

**دەڤگران / devg(i)ran/**: ئاوەڵناو. *[پلار]* خاوەخاوکەر لە گوتن و خواردندا ☰ کُند در حرف زدن و خوردن

**دەڤگلیز / devg(i)lîz/**: ناو. لیکاوی دەم ☰ لعاب دهان

**دەڤگەرم / devgerm/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ١. دڵگەرم ٢. لە وتندا خێرا ☰ ١. امیدوار ٢. سُخنور

**دەڤگەڕیان / devgeřyan/**: چاوگ. ئاخاوتن؛ پەیڤین؛ قسە کردن ☰ سخن گفتن

**دەڤگەم / devgem/**: ناو. لغاو؛ لەغاو؛ هەوسار ☰ لگام

**دەڤگـــەنی / devgenî/**: ناوەڵـــناو. *[پـــلار]* ١. دەمبۆگەنیو؛ دەمبۆگەن ٢. دەمپیس؛ زمـانشـڕ؛ جوێنفرۆش ١. دارای دهان بدبود ٢. بددهن

**دەڤل / devl/**: ناو. بەرە؛ تۆرەمە؛ بەرەباب نسل

**دەڤلخـــوون / devlixuûn/**: ناوەڵـــناو. خـــوێنمژ؛ خوێنخوار؛ خوازیاری کوشتن و خوێن ڕژانـدن خونخوار

**دەڤلغاب / devl(i)ğab/**: ناو. جۆرێ مار نوعی مار

**دەڤلۆ / devlo/**: ناوەڵناو. دەمکروچ؛ ڕووزەڵە (تـیخ) لبه شکسته (تیغ)

**دەڤلی / devlî/**: نـاو. ئاگـاداری؛ هـای آگهـی؛ اطلاعیه

**دەڤمری / devm(i)rî/**: ناوەڵناو. *[پلار]* کـەمقسـە لـە شەرمێونی خجول کمحرف

**دەڤن / dev(i)n/**: ناو. لووت؛ کەپۆ بینی

**دەڤۆک / devok/**: نـاو. ١. زاربێژ؛ قـەپاغ ٢. دەراو؛ شێوەی ئاخـافتن ١. درپـوش ٢. بیـان؛ شـیوەی گفتار

**دەڤە / deve/**: نـاو. ١. دەڤـەه؛ وشـتر؛ حوشـتر ٢. تەپاڵەی بە دەست شێلدراو ١. شتر ٢. تپاله

▣ **دەڤە دەشتی**: تەپاڵەی دەشت؛ ڕیخی وشک لـە دەشت تپالەی بیابانی

**دەڤەر / dever/**: نـاو. ١. دمـی تـیخ؛ لێـوی تیـژی خەنجەر و شیر و کێرد ٢. شـوێن؛ جـێ؛ جێگـە؛ جێگا ‹دەڤەرا ژیان› ٣. ئاقـار؛ دۆرمـادار؛ ئـالی ٤. ناوچە؛ مەنتەقە ‹دەڤەرا بادینان› ١. لبەی تیغ ٢. مکان؛ جای ٣. دوروبر؛ اطراف ٤. منطقه

**دەڤەروو / deverû/**: ☜ دەمەوڕوو

**دەڤـەری / deverî/**: ناوەڵـناو. سـەر بـە دەڤـەر منطقەای

**دەڤـەرۆ / deveřo/**: ناوەڵـناو. *[پـلار]* دەڤـــەژەن؛ چەنەباز؛ چەلتەکەر وراج

**دەڤەژەن / devejen/**: ☜ دەڤەڕۆ

**دەڤەه / deveh/**: ناو. دەڤە؛ وشتر؛ حوشتر شتر

**دەڤهلـو / devh(i)lû/**: نـاو. دەڤحلـوی؛ ڕیـایی؛ کلکەسووتە؛ کاری ماستاو سارد کردنەوە تملُق؛ چاپلوسی

**دەڤـی / devî/**: نـاو. دەوەن؛ دەون؛ پنجـــەداری لێڕەوار بوتەی درختچەهای جنگلی

**دەڤێک / devêk/**: نـاو. کلک؛ جووجکە؛ دوچکـە دُم

**دەق[1] / deq/**: ناو. ١. قەد ‹دەقـی کـە کراسـەکەت!› ٢. باری هەمیشەیی ‹وەک نە بام پێدا هاتبـێ نـە بۆران، هاتمەوە سەر دەقی جاران! «هـەژار، چێشـتی مجێور»› ٣. کەتیرەلێدراوی ٤. خاڵی کـوتراو ٥. مەتن؛ منهۆ؛ عەینی نووسراوەیەک بێ دەست لێ دان و گـۆڕان ٦. بەشـی سـەرەکی و گرینگـی نووسراوە یـان فـیلم ١. تـا ٢. وضـع موجـود ٣. آهارزدگی ٤. خال دستکوب ٥. متن ٦. سناریو

▣ **دەق دان**: ١. *[کینـایی]* ڕازاندنـەوە ‹بـۆ زەماوەنـد خۆی دەق داوە› ٢. خاڵ کوتان ٣. قـەد کـردن ٤. لووس کردنی چرچ و لۆچ ٥. کوتانی ئاوڵـە و شتیتر ١. آرایش کردن ٢. خـالکوبی کـردن ٣. تا کردن ٤. اتو کشیدن ٥. کوبیدن آبله

**دەق دانەوە**: لـە تەتەڵـە دانی دەغـڵ بـۆ زیـاتر خاوێن بوونەوە دوباره بیختن غلّه

**دەق شکان**: دەق شـێوان: ١. *[کینایە]* تێکچـوونی ئارایش و ڕازاوەیی کەسـێک ‹دەسـتی بـۆ کـار نەبرد نەکا دەقی بشکێ!› ٢. *[مەجاز]* تێکچـوونی خـوو و دۆخـی ئاسـایی کەسـێک ‹دوای ئـەو کارەساتە، تـەواو دەقـی شـکا و دەهـری بـوو› ٣. *[کینایە]* دەکار چوون. هـەروەها: **دەق شکاندن؛ دەق شێوان** ١. بە هم خوردن آرایش ٢. بـەهـم ریختن (اعصاب و روان) ٣. استفاده شدن

**دەق شێوان**: ☜ دەق شکان

**دەق کردن**: قەد کردن؛ بە سەر یەکا نووشتاندن.

هەروەها: **دەق بوون** ☰ تا کردن

**دەق گرتن:** ١. بە سەر یەکدا بە باشی قەد بـوون ٢.*[کینایی]* جێگـر بـوون ‹هـەموو کۆمەڵـگا بـەم هەڵس‌وکەوتە دەقـی گرتـووە› ٣.*[کینایی]* بوونـە داب ☰ ١. خوب برهم تا شدن ٢. شکل گرفتن ٣. رسم شدن

**دەق نەشکان:** ١.*[کینایـە]* تـازە بـوون ‹کـەوا و پاتۆڵەکەم دەقی نەشـکاوە› ٢.*[مەجاز]* بـەدەماخ بـوون ‹ماشەڵـڵا بـەو تەمەنـەوە دەقـی نەشـکاوە، ئەڵێی جوانی بیست ساڵەیە!› ☰ ١. تازە بـودن ٢. سرحال بودن

**دەق**[٢]: ئاوەڵناو. ١.*[کینایی]* بـەدەماخ؛ سـەرکەیف ٢. ساف و بێ‌چرچ و لـۆچ ☰ ١. شـاداب و سـرحال ٢. صاف و بی‌چروک

**دەق**[٣]: ئاوەڵکار. بێ‌کەم‌وزیـاد ‹هـەرچێکمان گوتبـوو دەق گێڕابوویەوە!› ☰ بی کم‌وکاست

**دەقاق** / deqaq/: ناو. ١. جەوی و کـەتیرەی دەق دانی قومـاش ٢. ئوتـۆ؛ ئوتـوو؛ وتـوو؛ تـووز؛ چـرچ‌لابـەر؛ جـل سـافکەر؛ کەرەسـەیەکە بـە پەڕەیەکی ساف و کانزاییەوە کـە داخ دەبـێ، بـۆ لابردنی چرچ و لۆچی قوماش ٣. جـگ؛ قـاب ☰ ١. آهار ٢. اتو ٣. شتالنگ

▣ **دەقاق دان:** ١. دەقاق لێدان ٢. وتوو کێشان ☰ ١. آهار زدن ٢. اتو کشیدن

**دەقان** / deqan/: چاوگ. کوتـانی خـاڵ لـە سـەر پێست ☰ خالکوبی کردن

**دەقاندن** / deqandin/: چـاوگ. خـاڵ کوتـان ☰ کوبیدن خال بر پوست

**دەقاندی** / deqandî/: ئاوەڵناو. خـاڵ‌لـێ‌کـوتراو ☰ خال‌کوبی‌شده

**دەقاودەق**[١] / deqawdeq/: ئاوەڵناو. ڕێـک بەرامبـەر ‹وەرگێڕانی دەقاودەق› ☰ مُنطبق

**دەقاودەق**[٢]: ئاوەڵکار. ١. ڕاستەوڕاست؛ تـەواو وەک یەک ‹دەقاودەق لەگەڵ بیر کردنەوەکـەی تـۆم› ٢. سەربەسـەر ‹پارەکـەی دەقـاودەق دەرچـوو› ☰ ١. دقیقاً ٢. پر به پر

**دەقدار** / deqdar/: ئاوەڵناو. ئاشـدار؛ بەشـۆ؛ کەتیرەلێ‌دراو ☰ آهارزده

**دەقدراو** / deqd(i)raw/: ئاوەڵناو. شـۆدار؛ کەتیرەلێ‌دراو ☰ آهارزده

**دەقدقاندن** / deqd(i)qandin/: چـاوگ. قدیلکـە دان ☰ قلقلک دادن

**دەقدقین** / deqd(i)qîn/: چاوگ. قدیلکـە دران ☰ قلقلک داده شدن

**دەقدەلاڤ** / deqdelav/: ناو. گیایەکی بێ‌گەڵایە لە ئاوا دەڕێ ☰ گیاهی آبزی

**دەقساندن** / deqsandin/: چاوگ. گوێ پێ نەدان؛ ئاوڕ لێ نەدانەوە ☰ اعتنا نکردن

**دەققە** / deqqe/: ☜ **دەقیقە**

**دەقکراو** / deqk(i)raw/: ئاوەڵناو. قـەدکراو؛ وەنووشتاو ☰ تاشده

**دەقل** / deqil/: ناو. دەقەل؛ تمتمان؛ زەوی سەخت کە بۆ کێلان ناشێ ☰ زمین سخت غیر قابل کشت

**دەقلوک** / deqluk/: نـاو. جـۆرێ مـازوو ☰ نـوعی مازوج

**دەقلووس** / deqlûs/: نـاو. تەقلـە؛ سـەرمەقولات ☰ پُشتک

**دەقن** / deqn/: نـاو. بـاتلاخ؛ زۆنـگ (لـەو دەقنـەدا چەقیم) ☰ باتلاق

**دەقنە** / deqne/: ناو. ڕاتبە؛ کاری پارسەک کردنی فەقێ؛ نان چنینەوە لە مـاڵان ☰ جمـع آوری نـان طلبەی علوم دینی

**دەق‌نەشکاو** / deqneşkaw/: ئاوەڵـناو. ١.*[کینایـە]* دەق‌ودەژە؛ تـازە و دەکارنـەکراو ٢.*[کینایـە]* یەخەسپی؛ دەس‌چەرمگ؛ خاوەن کار و ژیانی وا کە پیس نەبێ ☰ ١. آکبند؛ استفادەنشده ٢. یقەسفید

**دەقودۆغر** / deq û doğir/: ئاوەڵکار. دەپودۆغر؛ دەقودەق؛ دەقەڕوو؛ بێ ڕوودەربایستی ‹قسەی دڵم دەقودۆغر پێ گوت› ☰ رُک و راست

**دەقودەژ** / deq û dej/: ☜ **دەقنەشکاو-١**

**دەقودەق** / deq û deq/: ☜ **دەقودۆغر**

**دەقۆر** / deqor/: ناو. بزنی نە مەرەز نە موو ☰ نوعی بُز

**دەقە** / deqe/: ☜ **دەقیقە**

**دەقەڕوو** / deqeřû/: ☜ **دەقودۆغر**

**دەقەز** / deqez/: ☜ **دوژمن**[1]

**دەقەل** / deqel/: ☜ **دەقل**

**دەقەلوز** / deqelûz/: ناو. کاری خۆ هەڵدان و بازی بڵند هاویشتن ☰ پرش

**دەقەنا** / deqena/: ئامراز. بۆیە؛ لە بەر ئەمە ☰ برای این کە

**دەقیقە** / deqîqe/: ناو. دەققە؛ دەقە؛ دیقە؛ ١. خولەک؛ پاژێک لە شێست پاژی سەعات ٢. *[کینایە]* ناو؛ دەمێکی کەم ☰ ١. دقیقە ٢. لحظە

**دەک**[1] / dek/: ناو. فێڵ؛ گزی ☰ حیلە؛ نیرنگ

**دەک**[2]: دەنگ. ١. وشەی ئاواتخوازی یان تووک ‹چ وەختەن دڵت جە شادی کەیلەن/ دەک لێلاویت بۆ یە وەفا و مەیلەن؟ «مەولەوی»› ٢. وشەی خەمباری ‹دەک لاڵ بم بۆ تۆی کۆڵەبەرا› ٣. وشەی سەیرمان ‹دەک لەو هەموو درۆ و دەلەسە!› ☰ ١. کاش ٢. افسوس ٣. وە

**دەکارکراو** / dekark(i)raw/: ئاوەڵناو. بەکارهێنراو؛ کارپێکراو ☰ کارکردە

**دەکارنەکراو** / dekarnek(i)raw/: ئاوەڵناو. دەژ؛ مۆر؛ دەژ و دەق ☰ دستنخوردە

**دەکارهێنراو** / dekarhênraw/: ئاوەڵناو. لکار؛ نیمداشت؛ کارکردوو ☰ کارکردە

**دەکان** / dekan/: ناو. ١. پاش یەکان؛ دووهەم ڕیزی ژمارەگەلی سروشتی ٢. دە ساڵ ☰ ١. دهگان ٢. دهە

**دەکبوز** / dekbûz/: ناو. دەقلووس؛ تەقڵە؛ تەقلەبازی ☰ پُشتک

**دەکودەهو** / dek û dehiw/: ناو. فێڵ و تەڵەکە؛ گزە ☰ کلک

**دەکودیم** / dek û dîm/: ناو. چر و چاو؛ دەم و چاو؛ ڕوومەت ☰ رُخسار

**دەکۆ** / deko/: ناو. لەرە؛ لەرزە؛ شەکە ☰ لرزش

**دەکوو** / dekû/: ناو. ١. تل؛ بزاو ٢. لەرە ☰ ١. تکان ٢. لرزش

**دەکووش** / dekûş/: ناو. لانک؛ بێشکە؛ دەرگوش؛ دەیدیک ☰ گهوارە

**دەکە** / deke/: ناو. ١. سەکۆ ٢. هۆدەیەکی بچووک بۆ فرۆشتین شتگەلی جۆراوجۆر بەتایبەت چاپەمەنی ☰ ١. سکو ٢. دکّە

**دەکەل**[1] / dekel/: ناو. کۆسە؛ هورم ☰ کوسە؛ بی‌مو

**دەکەل**[2]: ئاوەڵناو. ١. بێ‌موو؛ سادە ٢. *[پلار]* زەلامی تەمەڵ ☰ ١. سادەرو ٢. تنومند تنبل

**دەکەڵ** / dekeł/: ناو. دیکەڵ؛ دیگەڵ؛ دیگەڵە؛ ئەستۆن؛ هوستون: ١. کۆڵەکەی گەمیە؛ کۆڵەکەیەکی ئەستوونی لە سەر کەشتی، بۆ هەڵدانی بادەوان و پاراستن لە لار و سەنگ بوونی ٢. دیرەگ؛ پێکهاتەیەکی ئەستوونی، بەرز و باریک لە چێو یان کانزا بۆ هەڵکێشانی شتومەک ☰ ١و٢. دکل

**دەگ** / deg/: ناو. داری بڵندی ناو گەمیە کە بادەوەی پێوە قایم دەکەن ☰ دیرک کشتی

**دەگمە** / degme/: ☜ **دەگمەن**[1]

**دەگمەن**[1] / degmen/: ئاوەڵناو. دەگمە؛ دەگەمە؛ نایاب؛ کەم‌وێنە ‹کچی وا ... ڕووسوور و، داوێنی وەها پاک، دەگمەنە ... «شێرکۆ»› ☰ نادر

**دەگمەن**[2]: ئاوەڵکار. هەڵکەوت ‹(بە) دەگمەن پەیدا دەبێ› ☰ بە ندرت؛ اتفاقی

**دەگەر** / deger/: ناو. ۱. زەبەردەستی؛ کارامەیی ۲. توان و تابشت ☰ ۱. مهارت ۲. نیرو؛ توان

**دەگەرە** / degere/: ناو. زۆر؛ هێز؛ گوژم؛ قەوەت؛ قەوە ☰ زور

**دەگەل**[1] / degel/: ناو. گاڵتە و گەپ ☰ شوخی

**دەگەل**[2]: ئاوەڵناو. زۆر زرینگ ☰ زیرک

**دەگەڵ** / degeł/: ئامراز. لەگەڵ؛ ڕەیەڵ؛ لەیەڵ؛ لەتەک: ۱. پێڕای؛ لەگەڵی ‹دەگەڵ خۆی بردی› ۲. لێل؛ چەنی ‹دەگەڵ تۆمە ئاڵتوون بەسەر/ لە پەنجەرە سەر بێنە دەر «فولکلۆر»› ☰ ۱. همراهِ ۲. با

**دەگەڵە** / degełe/: ناو. کەپەنکی لە بەڕە دروستکراو ☰ بالاپوش از گلیم

**دەگەمە** / degeme/: ☜ دەگمەن[1]

**دەگەنەک** / degenek/: ئاوەڵناو. ۱. زۆر بەهێز ۲. زەبەلاح؛ زلحورت ☰ ۱. نیرومند ۲. لندهور

**دەگەنەکی** / degenekî/: ئاوەڵکار. بخورتی؛ بەزۆری ☰ زورکی

**دەل** / del/: ئاوەڵناو. چاونەترس؛ دەمسوور ☰ جسور

**دەلا** / dela/: ناو. هەڵماتی گەورە ☰ تیلەی بزرگ

**دەلاش** / delaş/: ناو. بەرخۆڵەی ساوا ☰ برەی تازە متولد شده

**دەلاڤ** / delav/: ناو. ۱. گۆمیلکە؛ ئاوی قووڵی وەستاو ۲. جێگەی ئاودانی پەز ۳. داڤزەه؛ زەهاو ☰ ۱. آب ژرف و راکد ۲. آبشخور دام ۳. زهاب

**دەلاق** / delaq/: ناو. جۆرێ ئاواڵکراسی ژنانەی قەدیم ☰ نوعی تنبان قدیمی زنانه

**دەلاقە** / delaqe/: ناو. ۱. ڕۆچنە؛ کون لە دیواردا ۲. تاقە لە دیواردا ۳. پەنجەرە ☰ ۱. روزنە ۲. طاقچه ۳. پنجره

**دەلاک** / delak/: ناو. دەڵلاک: ۱. ناتر؛ مرۆشۆر لە گەرماودا ۲. سەرتاش ☰ ۱. کیسەکش حمام ۲. سلمانی

⊡ **سەر بێدەلاک تاشین**: *(پلار)* بەبێ زانینی کارێ، دەس تێوەردانی ☰ بی دانش و توانایی کاری، بدان پرداختن

**دەلاکخانە** / delakxane/: ناو. سەرتاشخانە؛ دووکانی سەرتاش ☰ دکان سلمانی

**دەلال** / delal/: ئاوەڵناو. جوان و خوێنشیرین ☰ زیبای دلکش

**دەلالۆ** / delalo/: ☜ دەلۆلۆ

**دەلالی** / delalî/: ناو. قەنجی؛ هەنگ؛ جوانی ☰ زیبایی

**دەلالێ** / delalê/: ناو. لایەلایە؛ لایلایی؛ گۆرانی بۆ دە خەو کردنی منال ☰ لالایی

**دەلامەت** / delamet/: ناو. ۱. ئەرک؛ پەیڤر؛ وەزیفە ‹وان دەلامەتا خوە ب جه نەئانی› ۲. ڕۆڵ؛ دەور ‹دەلامەتا ڤێ پەیڤێ د هەڤۆکێ دە چییە؟› ☰ ۱. وظیفه ۲. نقش

**دەلای** / delay/: چاوگ. لێ دان ☰ زدن

**دەلدەلۆک** / deldelok/: ناو. شوانخلەتێن؛ مەلێکی بۆرەڵۆکەیە لە پاساری گەورەتر ☰ شبانفریبک

**دەلف** / delf/: ناو. هەل؛ دەرفەت ☰ فُرصت

**دەلق** / delq/: ناو. ۱. عەیب و عار ۲. پەڕەیەکی وەک شیشە لە جنسی نایلۆن ☰ ۱. ننگ ۲. طلق

**دەلقین** / delqîn/: چاوگ. ئابڕوو چوون؛ ناو زڕان ☰ رسوا شدن

**دەلک** / delk/: ناو. سواق؛ سواغ ☰ عمل اندودن

**دەلکی** / delkî/: ئاوەڵناو. جەفەنگباز؛ حەنەکچی ☰ شوخطبع

**دەڵلاک** / dellak/: ☜ دەلاك

**دەڵلە**[1] / delle/: ناو. ۱. قاوەجۆش؛ پیاڵەی دەسکدار بۆ قاوە لێنان ۲. ئامرازی کون کردنی کراس و بەرگ بۆ قرتینە ☰ ۱. قهوەجوش ۲. وسیلەی سوراخ کردن پارچه برای منگنه

**دەڵلە**[2]: پێرۆ. ← قەڵلەودەڵلە

**دەڵلەک** / dellek/: ☜ دەڵەك ـ۱

**دەلم** / delm/: ناو. دۆلچە 🇮🇷 دلو

**دەلمە** / delme/: ناو. جبە؛ بالاپۆشی پێش ئاوەڵەی مەلایان 🇮🇷 جبّەی آخوندی

**دەلنگ** / deling/: ناو. دەلینگ: ١. لای خوارووی قاچ؛ لە ئەژنۆ بەرەژێر تا پانیە ٢. ئەو بەشە لە جلک وا بەلەک دادەپۆشێ 🇮🇷 ١. پاچە ٢. پاچەی شلوار

**دەلنگهەڵکراو** / delinghełk(i)raw/: ئاوەڵناو. ١. [پلار] بێشەرموحەیا ٢. [کینایە] ئامادەی کار 🇮🇷 ١. پاچەورمالیدە ٢. آمادە

**دەلوبیبەر** / delubîber/: ناو. بیباری شین کە دەکرێتە دۆلمە 🇮🇷 فلفل دُلمەیی

**دەلوقەل** / del û qel/: ئاوەڵناو. [پلار] ١. زۆربلێ؛ چەنەباز ٢. بێشەرموحەیا 🇮🇷 ١. وراج ٢. بی‌شرم

**دەلوێدومان** / delwêduman/: ناو. [پلار] ١. دەلیدومان؛ وشکەڕن؛ ئیشکەڕن؛ یاریدەری تەنافباز ٢. پالەوانفسفس؛ پالەوانپەمە 🇮🇷 ١. دلقک دستیار بندباز ٢. پهلوان‌پنبه

**دەلۆش** / deloş/: ئاوەڵناو. بێئەمەگ؛ بێوەفا. هەروەها: **دەلۆشی** 🇮🇷 ناسپاس

**دەلۆلۆ** / delolo/: دەنگ. دەلالۆ؛ دەلێلێ؛ سەربەندی لاوک 🇮🇷 کلمە پیش درآمد برخی از ترانەها

**دەلو** / delû/: ئاوەڵناو. ١. دین؛ شێت [٢]. فڕبێژی بێحەیا ٣. [پلار] بەزمگێڕ 🇮🇷 ١. دیوانە ٢. هرزەگوی بی‌شرم ٣. مُطرب

**دەلوجە** / delûce/: ناو. بیباری سوور 🇮🇷 فلفل قرمز

**دەلوڤ** / delûv/: ناو. ڕەشەمە؛ دوامین مانگی ساڵی هەتاوی ئێرانی 🇮🇷 اسفند ماه

**دەلوقەل** / delûqel/: ئاوەڵناو. [پلار] ١. ڕووهەڵماڵراوی چەنەباز ٢. گەدەوگودە 🇮🇷 ١. حرّاف بی‌حیا ٢. الوات

**دەلوکار** / delûkar/: ئاوەڵناو. [پلار] نیوەشێت؛ گێژ و وڕ ‹گوتم: زەبیحی خۆمانین، ئەگەر بوێرم دەڵێم ئەو کابرایە [قاسم] دەلووکارە! نیوە شێتە! «هەژار، چێشتی مجێور»› 🇮🇷 خُل‌مزاج

**دەلویی** / delûyî/: ناو. ١. شێتی؛ گەللایی ٢. بێحەیایی؛ بێشەرمی 🇮🇷 ١. خُلی ٢. بی‌شرمی

**دەلە** / dele/: 👈 دەڵە[٢]ـ[٢]

**دەلەسە** / delese/: ناو. درۆ؛ قسەی هەڵبەستە 🇮🇷 چاخان

**دەلەکانێ** / delekanê/: 👈 دیلەکانێ

**دەلەم** / delem/: 👈 دەیلەم

**دەلەندە** / delende/: ناو. دەزگیرانی مارەبڕاو 🇮🇷 نامزد عقد شده

**دەلە** / dele/: 👈 دەڵەك ـ١

**دەلی** / delî/: ئاوەڵناو. نیوەشێت 🇮🇷 خُل

**دەلیا** / delya/: ناو. دەریا: ١. زریا ٢. [مەجاز] یەکجار زۆر 🇮🇷 ١. دریا ٢. بسیار زیاد

**دەلیالوش** / delyalûş/: ئاوەڵناو. [پلار] یەکجار زۆرخۆر 🇮🇷 بسیار پرخور

**دەلیان** / delyan/: 👈 دەڵان[١]

**دەلیدومان** / delîduman/: 👈 دەلوێدومان

**دەلیڤ** / delîv/: 👈 دەلیڤە

**دەلیڤە** / delîve/: ناو. دەلیڤ؛ هەل؛ کێس؛ دەرفەت 🇮🇷 فرصت

**دەلیقانی** / delîqanî/: ئاوەڵناو. [پلار] ژنی بێشەرم و زماندرێژ 🇮🇷 سلیطەی زبان‌دراز

**دەلیل** / delîl/: ناو. ١. بەڵگە؛ پرنۆ؛ بەڵسا ‹دەلیلت بۆ ئەم قسانەت چییە؟› ٢. هۆ؛ سۆنگە؛ بۆنە ٣. نیشانە؛ نیشانی؛ شانەک ‹دووکەڵ دەلیلی ئاورە› ٤. ڕێنوێن؛ ڕێشاندەر 🇮🇷 ١تا٣. دلیل ٤. راهنما

**دەلین** / delîn/: چاوگ. واق وڕمان 🇮🇷 شگفت‌زدە شدن

**دەلینگ** / delîng/: 👈 دەلنگ

⊡ **بە دەلینگی کەسێکەوە نوسان**: [پلار] قاچی

کەسێک گرتن؛ چەق گرتنە مل کەسێکا ▤ پاچەی کسی را گرفتن

**دەلینگە** / delînge/: ☜ دەرەلنگ ـ١

**دەلینگهەڵپێچراو** / delînghełpêçraw/: ئاوەڵناو. [کینایە] قول‌هەڵماڵاو؛ زرنگ و ئامادەی کار ▤ آمادەی کار

**دەلێلێ** / delêlê/: دەنگ. دەلالێ؛ دەلۆلۆ؛ سەربەندی لاوک ▤ کلمه پیش درآمد برخی از ترانەها

**دەڵ**[1] / deł/: ناو. ١. دەڵە؛ دێڵە؛ دێڵ؛ مێوینەی سەگ و گورگ ٢. کار و ڕەوتی دەلان ▤ ١. مادینەی سگ و گرگ ٢. تراوش

**دەڵ**[2]: ئاوەڵناو. ١. مێوینە؛ مێنگە (بێچگە مرۆ) ٢. [پلار] ژنی بێ‌شەرم و حەیا ▤ ١. مادینه (حیوان) ٢. زن بی‌شرم

• **دەڵ**[3]: پاشەوشە. دەڵێن ‹ئاودەڵ› ▤ تراوا

**دەلاڵ** / dełał/: ناو. ١. نێوانچی؛ کزیر؛ خۆشکەری کڕین و فرۆشتن لە نێوان کڕیار و فرۆشیاردا ٢. [پلار] کەسێ کە ژن بۆ پیاو تاو دەکا ▤ ١. دلال؛ واسطه ٢. دلال محبت

**دەلاڵانە** / dełałane/: ناو. مزی دەلالی ▤ مزد دلالی

**دەلاڵخانە** / dełałxane/: ناو. هەراجەبازار ▤ بازار دلالان

**دەلاڵەت** / dełałet/: ناو. ١. کاری دڵدانەوە؛ دڵخۆشی دانەوە ٢. ڕێشاندەری؛ ڕێنوێنی ▤ ١. دلنوازی ٢. رهنمونی

**دەلاڵی** / dełałî/: ناو. ١. کاری دەلاڵ ٢. مزی دەلاڵ ▤ ١. عمل دلال ٢. مُزد دلال

**دەلان**[1] / dełan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //دەلای؛ دەدەلێی؛ بدەلێ// دەلیان؛ دەلێن؛ دیلان: ١. پرزانەوە؛ هاتنە دەری وردەتنۆکی تەڕایی لە دەوروبەری دەفردا ٢. [کینایی] درکان؛ ئاشکرا بوونی نهێنی ▤ ١. تراویدن ٢. افشا شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: دەلاو/ چاوگی نەرێنی: نەدەلان

**دەلان**[2]: ناو. دەلانە؛ ناودەلان؛ پلەی پەیژە ▤ پلەی نردبام

**دەلاندن** / dełandin/: چاوگ. تێپەڕ. //دەلاندت؛ دەدەلێنی؛ بدەلێنە// دەلانن؛ دیلاندن: ١. تەڕایی دان ٢. [کینایی] درکاندن؛ ئاشکرا کردنی نهێنی ‹لەو نهێنییە هیچی نەدەلاند› ▤ ١. تراوش کردن ٢. افشا کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەدەلاندن

**دەلانن** / dełanin/: ☜ دەلاندن

**دەلانە** / dełane/: ☜ دەلان[2]

**دەلاو**[1] / deław/: ناو. ١. جێگەی زنە و هەمیشە تەڕ ٢. دڕناو؛ دڕنال؛ ڕۆ؛ کەنداو؛ لاوچ؛ لاوەچ؛ خەلیج؛ پێشەوەچوویی ئاوی دەریا لە وشکانیدا ٣. گیای سێ سووچی ناو زەلکاو ▤ ١. زهاب ٢. خلیج ٣. نوعی گیاه باتلاقی

**دەلاو**[2]: ئاوەڵناو. تەرەشوح‌کردوو ‹ئاوی دەلاو ناگەڕێتەوە› ▤ تراویده

**دەڵب** / dełb/: ☜ دەڵپ

**دەڵپ** / dełp/: ئاوەڵناو. دەڵب؛ گوشاد؛ تایبەتمەندی پۆشەمەنی هەراو ▤ گُشاد

**دەڵپوداهۆڕ** / dełp û dahoř/: ئاوەڵناو. [پلار] دەڵپ و دۆپ؛ زۆر گوشاد؛ فرە هەراو ▤ بسیار گُشاد

**دەڵپودۆپ** / dełp û dop/: ☜ دەڵپوداهۆڕ

**دەڵق** / dełq/: ☜ دڵق

**دەڵقی** / dełqî/: ☜ دڵقی

**دەڵمە** / dełme/: ☜ دەڵمە

**دەڵوبەڵ** / deł û beł/: ئاوەڵناو. ١. ئاڵوبۆڵ ٢. بەڵبووگ؛ تایبەتمەندی میوەی نەرمی نزیک بە ڕزیو ▤ ١. ویژگی میوەی نورس ٢. ویژگی میوەی نرم شده در مرز گندیدگی

**دەڵە**[1] / dele/: ☜ **دەڵ**[1]ـ١

**دەڵە**[2]: ناوەڵناو. ١. خوێـڕی و جلـف و بێکـارە ٢. دەلە؛ زۆر مالانگەڕ ٣. لانەواز؛ تەوەلا (بۆ مـەل) ☰ ١. هرزە و جلف ٢. دلە ٣. آشیان گم‌کردە (پرندە)

**دەڵە ـ**[3]: پێشوشـە. ١. مێوینـە؛ مێنگـە ‹دەڵەسـەگ؛ دەڵەدێو› ٢. ـ دەڵـێن؛ دەڵانـە ‹دەڵـەمێز› ☰ ١. مادە ٢. ـ پس‌دِه (مایع)

**دەڵەبـەبا** / dełebeba/: نـاو. دەڵـەق؛ دەڵـەوەبا؛ دێڵەبەبا؛ مێوینە سەگی وە با هاتوو ☰ مادە سـگ جفت‌خواه

**دەڵەچە** / dełeçe/: ناوەڵناو. *[پلار]* ڕووبـێن؛ ڕیابـاز. هەروەها: **دەڵەچەیی** ☰ ریاکار

**دەڵـەدز** / dełediz/: ناوەڵـناو. کـــەردز؛ لادز؛ سیرمەخۆر؛ هووردز؛ خووگرتوو بە دزیـنی شـتی بێ‌نرخ. هەروەها: **دەڵەدزی** ☰ دلەدُزد

**دەڵەدەڵ** / dełedeł/: ناو. ١. نزیـک بـە گەیشـتنی مێـوە یـان کـوان ٢. نزیـک بـە هێلکـە کـردنی مریشک ٣. دۆخـی شلـەقان؛ بـەم لا و بـەو لادا کەوتن ٤. کاری بڕیار دان، لەبـەر خـۆوە و نـەک زۆر بە ئاشکرا ‹دیار بوو هەواڵەکانی ... دەڵەدەڵیانە بڕۆنـەوە «هـەژار، چێشـتی مجێـور»› ☰ ١. حالـت نزدیک به رسیدن میوە یا دُمل ٢. حالـت نزدیـک بـە تخم‌گذاری مُرغ ٣. حالت به این سو و آن سو افتـادن ٤. عمل تصمیم گرفتن نیمە پنهانی

**دەڵـەدێو**[1] / dełedêw/: نـاو. دێـــوی مێوینـــەی چیرۆکان ☰ دیو مادینەی افسانەها

**دەڵەدێو**[2]: ناوەڵناو. *[پلار]* ١. عیفریتی ژن ٢. ناحـەز و قەڵەوی زەبەلاح (ژن) ☰ ١. عفریتـە ٢. گُنـدەی بدقوارە (زن)

**دەڵەسە** / dełese/: ☜ **دەڵەسەگ**

**دەڵەسـەگ** / dełeseg/: نـاو. دەڵەسـە: ١. سـەگی مێوینە ٢. *[ناشیرین]* جنێوێکە بـە ژنی بـێ‌حـەیای دەڵێن ☰ ١. مادە سگ ٢. سلیطە

**دەڵەشڕ** / dełeşiř/: ناو. *[ناشیرین]* جنێوێکە بە کچی دەڵێن ☰ دُشنامی بە دختران

**دەڵەشێر** / dełeşêr/: ناو. شێری مێ ☰ مادە شیر

**دەڵەق** / dełeq/: ☜ **دەڵەبەبا**

**دەڵـەک** / dełek/: ناو. ١. دوولەک؛ دەللەک؛ دەڵـە؛ جانەوەرێکە لـە تـیرەی ڕێـوی بـەڵام پچـووکتر، کەوڵی بەنرخە ٢. کاری پاڵ پێوە نان ☰ ١. دلە ٢. هُل

⊡ **دەڵـەک دان**: تەکانی لە ناکاو خـواردن ☰ تکـان خوردن

**دەڵەک نان**: دەس پێـوە نیـان؛ پـاڵ پێـوە نـان ‹دەڵەک نەنـە لی لـە بـام هەسـتی/ خەنـەی نـاو گرداب فەقر و تەنگدەستی «شامی»› ☰ هُل دادن

**دەڵەکدەر** / dełekder/: ناوەڵناو. گلێن؛ پاڵ پێوەنەر ☰ هُل دهندە

**دەڵەمە**[1] / dełeme/: ناو. دلمە؛ دۆڵـەمە؛ دۆڵـەمێ؛ دەڵـەمە: ١. ولولـە؛ ورورە؛ گـەرای نـاو سـکی مریشک ٢. شیری بە ئامیانی پەنیر گرساو کە بە دۆشاوەوە دەیخۆن ☰ ١. تخم نیم‌بند در شکم مـرغ ٢. پنیر دلمە

**دەڵەمە**[2]: ناوەڵناو. دلمە؛ دۆڵەمە؛ دۆڵەمێ؛ دەڵـەمە: ١. شلی هێشتا نەگووشراو ٢. نیوەخۆگرتوو؛ تەواو خۆ نەگرتوو ☰ ١. نافشردە ٢. نیم‌بند

**دەڵـەمیز** / dełemîz/: ناوەڵـناو. *[پـلار]* دەڵـــەمێز؛ کونەمیز ☰ شاشو

**دەڵەمێز** / dełemêz/: ☜ **دەڵەمیز**

**دەڵەوەبا** / dełeweba/: ☜ **دەڵەبەبا**

**دەڵیان** / dełyan/: ☜ **دەڵان**[1]

**دەڵین** / dełîn/: ☜ **دەڵان**[1]

**ـ دەڵێن** / dełên/: پاشەوشە. ـ دەڵ؛ دادەر ☰ تراوا

**دەڵێی** / dełêy/: ناوەڵکار. هەر وەک؛ ئـەیژی؛ بـیر دەبەی؛ خەیاڵ دەکـەی ‹دەڵـێی ماسـتی مـەیبوە «مەسەل»› ☰ انگار؛ پنداری؛ تو گویی

**دەم**[1] / dem/: ناو. دم؛ دەو؛ دەمگە؛ دەڤ: ١. زار؛ زەهر؛ زیەر؛ چیەر؛ هلۆلییەک لە جەستەی هەموو گیاندارانداکە لەوێوە خۆراک دەچێتە ناو لەشیانەوە. لە جەستەی مۆرغەداراندا، لە نێوان لێو و گەروودایە و زمان و ددان و هاروو دەگرێتەوە ‹سەرم ناوێ کە فیزی بەگلەری و سەرداری بنوێنێ/ دەمم ناوێ کە تیکەی زل ــ زلی تەنهایی بگلێنێ «قانع»› ٢. کات؛ وەخت ‹دەمێک ساقی دەمت بێنە، دەخیلی چاوەکانت بم/ بە جامێک دەستی من بگرە، فیدای پیری موغانت بم «وەفایی»› ٣. لێوی تیخ ‹لە سەودادا دەمی کاغەز سەری خست/ لە بەختی من، سکی پڕ بوو، بەری خست «نالی»› ٤. ڕەوتی پێ‌گەیشتنی برنج و چای و ... ‹چا دەم کردن› ٥. دەمە؛ مووشەدەمەی کانزاتوێنەوە ٦. دەنگ ‹دەم خۆش، گۆرانییەکی خۆش بوو!› ٧. هەناسە؛ نەفەس ‹ساقی! قەدەحێک، ژیان یەک دەمە/ هەر بە خۆشی بێ، ئەو دەمەش بەسمە «گۆران»› ٨. زمان؛ زوان ‹دەم بویسێ سەر سلامەتە «مەسەل»› ☰ ١. دهان ٢. وقت ٣. لبەی تیغ ۴. فرایند دم کشیدن ۵. دمەی آهنگری ۶. صدا ۷. نفس ۸. زبان

◘ **دەم بوون:** دەم کێشان؛ ئامادە و بەرهەڤ بوونی ئەوەی کە لێ‌نراوە ☰ دم کشیدن

**دەم باز/ واز کردن:** دەم کردنەوە؛ قسە کردن ☰ صُحبت کردن

**دەم بوونە تاقی چرا:** ☜ **دەم بوونە تەڵەی تەقیو**

**دەم بوونە تەڵەی تەقیو:** *[مەجاز]* دەم بوونە تاقی چرا؛ لە شتێکی کوتوپڕی واق وڕمان و قسە پێ نەکران ☰ لالمونی گرفتن

**دەم بەردان:** *[پلار]* زۆر وتن؛ زماندرێژی کردن ☰ زباندرازی کردن

**دەم بە قوتەوە گرتن:** *[کینایە]* ١. هیچ نەخواردن ٢. قسە نەکردن ☰ ١. لب بە غذا نزدن ٢. هیچ نگفتن

**دەم بە یەکا هاتن:** *[کینایە]* دەم پێکا هاتن؛ قسە جوونەوە؛ قسە باش بۆ نەهاتن ☰ حرف نیامدن

**دەم پان کردنەوە:** *[کینایە]* گەوجانە پێکەنین ☰ بی معنی خندیدن

**دەم پێکا هاتن:** ☜ **دەم بە یەکا هاتن**

**دەم تەقاندن:** ١. تەقە لە دەمەوە هێنان ٢. *[کینایە]* زۆر پێ خۆش بوون ☰ ١. از دهان صدا درآوردن ٢. کیف کردن

**دەم تێژەندن:** ١. زار نانە ناو خواردنەوە ٢. *[کینایە]* خەرجی زیاد کردن لە دارایی ☰ ١. دهان در نوشیدنی گذاشتن ٢. اسراف کردن

**دەم تێکەڵ بوون:** قسە بۆ نەهاتن ☰ تُپُق زدن

**دەم تێوەدان:** *[پلار]* قسە لێ‌کردنی لاپرەسەنانە ☰ دخالت کردن (بی‌جا)

**دەم چوونە کلێنە:** *[مەجاز]* زار ڕەق بوون؛ قسە بۆ نەهاتن ☰ لالمونی گرفتن

**دەم چەور کردن:** *[پلار]* بەرتیل دان ☰ رشوە دادن

**دەم داچەقان:** *[پلار]* زار ئاواڵە بوون؛ زۆر سەیر مان ☰ دهان بازماندن از تعجب

**دەم داچەقاندن:** *[پلار]* دەم داچەقان: ١. زار کردنەوە ٢. مردن ☰ ١. دهان گشودن ٢. مردن

**دەم داچەقان:** ☜ **دەم داچەقاندن**

**دەم دادروون:** دەم دروون: ١. *[کینایە]* بێ‌دەنگ بوون ٢. *[کینایە]* بێ‌دەنگ کردن ٣. زارک (شتێ) دروون ☰ ١. ساکت شدن ٢. ساکت کردن ٣. دهانە (ی چیزی را) دوختن

**دەم داکەوتن:** *[مەجاز]* زۆر قسە کردن ☰ بسیار حرف زدن

**دەم دان:** *[کینایە]* ١. تازە شین بوونی گیا و سەوزی ٢. لەوەڕین ‹بزنەکە دەم ئەدا› ٣. دەماندنی مووشەدەمە ٤. لە دوو دان و درێژ کردنەوە ☰ ١. بردمیدن سبزە ٢. چریدن ٣. دمە

دماندن ۴. به درازا کشانیدن

**دەم دانەوە:** ۱. پشکووتنی گوڵ ۲. دڕانی کوان ف ۱. شکُفتن ۲. سر باز کردن دمُل

**دەم درون:** ☜ دەم دادرون

**دەم ڕاست بوونەوە:** *[کنایە]* دارا بوونەوە دوای هەژاری ف ثروتمند شدن بعد از نداری

**دەم شۆردن:** *[کنایە]* دەم سڕین؛ لە قسەی پیس تۆبە کردن ‹لە پێشدا دەمت بشۆ جا ناوی کوردستان بێنە!› ف دهان را آب کشیدن

**دەم کرانەوە:** *[کنایە]* زمان گەزارە بوون؛ بە زمان هێرش بردنە سەر ف دهن باز شدن (به هتّاکی)

**دەم کردن:** سەر داپۆشین و نانە سەر ئاگر بۆ ئامادە بوون ف دم کردن

**دەم کردنەوە:** دەم باز کردن: ۱. قسە کردن ۲. دەم دانەوە؛ ئاواز خوێندن ‹بولبول دەخوێنێ، با لە دەفی بەرگی گوڵ دەدا/ غونچە لەباتی گوێ بگرێ، دەم دەکاتەوە «حاجی قادر»› ۳. *[کنایە]* لێک بوونەوە ‹زامەکەم دەمی کردۆتەوە› ف ۱. حرف زدن ۲. آواز خواندن ۳. دهان باز کردن (زخم و ...)

**دەم کێشان:** ئامادە بوونی برینج و چایی و ... لێنراو بە بۆق کردن ف دم کشیدن

**دەم گرتن:** *[مەجاز]* زۆر قسە کردنی بە گەرمی ف چانە گرم شدن

**دەم گرتنەوە:** *[مەجاز]* پارێز کردن لە خواردن ف رژیم گرفتن

**دەم لە جەرگ نان:** *[کنایە]* زۆربلێیی کردن و بوونە هۆی ئازاری گوێگران ‹دوو ساعەتە دەمی ناوەتە جەرگم، دەمی شل نابێ!› ف وراجی کردن

**دەم لە دەم نان:** ☜ دەم نانە دەم

**دەم لە شتێ شیرین بوون:** *[کنایە]* شتێ/ کارێ باش هاتنە دەستەوە و پێوە دڵخۆش بوون ‹دەمم لە کاسبی شیرین بوو. وردە ـــ وردە مەڕم کڕی، ماینم کڕی و بوومە ماڵێک لە ڕیزی ماڵان «هەژار، چێشتی مجێور»› ف چیزی به مذاق خوش آمدن

**دەم لێدان:** ☜ دەم لێکدان

**دەم لێکدان:** *[کنایە]* دەم لێدان؛ چەنە لێدان؛ زۆر وتن ف یاوه گفتن؛ پرگویی کردن

**دەم لێکنان:** ۱. بێدەنگ بوون ۲. *[کنایە]* مردن ف ۱. خاموش شدن ۲. مُردن

**دەم نانە دەم:** *[مەجاز]* دەم لە دەم نان؛ دەمنەدەمانێ کردن ‹بۆ تۆ عار نییە دەمت ناوەتە دەمی کەسی وا ناحاڵی؟› ف دهن به دهن شدن

**دەم نەوێستان/ نەوێسان:** *[مەجاز]* زمانشڕی کردن؛ تێدا نەوێستان ‹دەمی ناوێستێ، ئابڕوومان دەبا› ف دهن‌لقی کردن

**دەم و زاراو خۆش بوون:** *[کنایە]* قسەوباس جوان و دڵگەشێن بوون ‹دەم و زاراوی زۆر خۆش بوو، قسەکانیشی هەمووی گاڵتە و گەمە بوو› ف خوش‌صحبت بودن

**دەم و لووت بە یەکدا دان:** *[مەجاز]* ناوچاو تورشاندن؛ ڕەنجاو و خەمبار بوون ف ابرو در هم کشیدن

**دەم هاتن بە یەکدا:** *[کنایە]* جوان قسە پێ نەکران ف نافصیح شدن

**دەم هەڵپچڕان:** *[کنایە]* قسە دەست پێ کردن ف شروع به صحبت کردن

**دەم هەڵێنان:** *[کنایە]* دەم کردنەوە بۆ قسە ف لب گشودن

**دەم هەڵێنانەوە:** *[کنایە]* ئامادە بوون بۆ وەرام دانەوە ف آمادەی جواب شدن

**دەم هێنانە پێش:** *[کنایە]* خۆ تێهەڵقورتان و قسە کردن ف مُداخله کردن

**دەم یەک نیان:** *[کنایە]* خپ بوون؛ مردن ف مُردن

**دەمی کەسێک بۆی شیر دان:** *[کنایە]* هێشتا مندال

بوون ‹ژنت دەوێ؟ تۆ هێشتا دەمت بۆی شیر ئەدا!› ☰ دهان کسی بوی شیر دادن

**دەمی کەسێک شکاندن:** *[کینایە]* کەسێک بەزاندن و سووک کردن ☰ دماغ کسی را به خاک مالیدن

**بونە دەم مردگ:** *[کینایە]* سارد و بێتام بوونی چێشت ☰ از دهان افتادن

**پەڕ بە دەور دەمدا هاوردن:** *[کینایە]* خلافاندن؛ خافلاندن؛ به وادەی بنشڕ دڵخۆش کردن ☰ دِر باغ سبز نشان دادن

**چونە دەم کەسێکەوە:** *[کینایە]* ١. بۆ یارمەتی دانی کەسێ کەوتنە ڕێ ٢. پێشوازی لە کەسێ کردن ☰ ١. به یاری کسی شتافتن ٢. به استقبال کسی رفتن

**دانە دەم:** *[مەجاز]* لە دوا دان ☰ تمدید کردن؛ ادامه دادن

**دانە دەم کەسێکەوە:** *[مەجاز]* بۆ کەسێ شل کردن؛ ڕێ دان به کەسێ گوساخ ببێ ☰ رو بە کسی دادن

**لە دەم دەرپەڕین:** *[مەجاز]* بێویست و لەپڕ قسە کردن ‹نەمزانی، لە دەمم دەرپەڕی ناوی باوکیم برد› ☰ از دهان کسی پریدن

**لە دەم کەسێ سەندنەوە:** *[مەجاز]* قسەی کەسێ لە بەرژەوەندی خۆ درێژە پێ دان ☰ حرف کسی را مصادره به مطلوب کردن

**لە دەم گرتنەوە:** *[کینایی]* لەوپەڕیدا دەست پێوە گرتن ☰ نهایت درجه صرفەجویی کردن

**دەم**[٢]: ئاوەڵناو. *[کینایە]* ئامادە؛ بەرهەڤ ‹چایمان دەمە› ☰ آماده

**دەم**[٣]: پێشوشە. بەدەم ‹دەمهار؛ دەمنەوێساو› ☰ پیشواژەی صفتساز

**ـ دەم**[٤]: پاشەوشە. ـ دەمکێش ‹تازەدەم؛ دێردەم› ☰ ـدم

**دەم**[٥]: ئامراز. دەمێ؛ کەناری؛ پالی ‹دەچوومە قاوەخانەیەکی دەم چەم کە هەوالان ببینم «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ دمِ

**دەما**[١] / dema/: ناو. پلەی ساردی و گەرمی بە گوێرەی پێوەمانێکی دیاریکراو (وەک: سلسیووس و فارنهایت) ☰ دما

**دەما**[٢]: ئاوەڵکار. دەمەدا؛ کاتێکی؛ وەختێکی ‹لەو دەما تۆ هاتی دنیاکە تۆزوخۆڵ بوو› ☰ وقتی

**دەماخ**[١] / demax/: ناو. دەماغ: ١. کەیف؛ خۆشی؛ سەرخۆشی ‹هەردەم بێ دەماخ خاتر زویرم/ هەرگیز نمەشی تاوێ جە ویرم «سەیدی»› ٢. مێشک؛ مژی ٣. کەپۆ؛ لووت ٤. کام؛ نەخۆشی زاری ولاخ ٥. ڕووبەند ☰ ١. حس و حال ٢. مُخ ٣. بینی ۴. نوعی بیماری دهن ستور ۵. نقاب

◘ **دەماخ تەخت کردن:** بە خۆشی ڕابواردن ☰ بە کام دل گذراندن

**دەماخ کردن:** ١. ☜ **دەماخ هەڵدان** ٢. کام کردن ☰ ١. ☜ **دەماخ هەڵدان** ٢. بە بیماری دهن مبتلا شدن ستور

**دەماخ کەسێ شکاندن:** *[مەجاز]* کەیفخۆشی لە کەسێک تێکدان ☰ عیش کسی را کور کردن

**دەماخ هەڵبەستن:** ☜ **دەماخ هەڵدان**

**دەماخ هەڵدان:** دەماخ کردن؛ دەماخ هەڵبەستن؛ بەرلووت هەڵپێچان ☰ نقاب زدن

**دەماخ**[٢]: ئاوەڵناو. دەماغ؛ بەدەماخ ‹باز چێش بۆ یاران دەروون پڕ داخەن؟/ ئەغیاران دەماخ، دڵ وە پەرداخەن «مەولەوی»› ☰ شاد؛ سرحال

**دەماختەخت** / demaxtext/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* کەیفساز؛ تەڕدەماخ ☰ شاد و شنگول

**دەماخچاخ** / demaxçax/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دڵخۆش؛ دڵشاد؛ شاد ☰ شاد

**دەماخچاخی** / demaxçaxî/: ناو. *[مەجاز]* کۆکی؛ سەرحاڵی ☰ تردماغی

**دەمادەم** / demadem/: ئاوەڵکار. دەماودەم؛

دەمبەدەم؛ لەپەستا؛ لە سەر یەک ‹جێی دەم دەمە، جێی لەب لەبە، ساقی وەرە ئیمشەب/ هەم ماچی دەمادەم بدە! هەم جامی لەبالەب «نالی»› ☰ پی‌درپی

**دەمار** / demar/: ناو. دامار: ١. ڕەگ ٢. دەزوولەئاسای لەشی گیانەوەر کە هەست و دنەکان دەباتە مێشک و وەڵامەکان دەگەیێنێتە ئەندامان ٣. داروکەی ناو گەڵا تووتن و ... ٤. فیز؛ دەعیە ٥. غیرەت و جوامێری ☰ ١. رگ ٢. عصب ٣. رگە ۴. تکبر ۵. وقار

▣ **دەماری ڕەهێش**: دەماری سیاتیک؛ دەماری هەست و جوولەی پا ☰ عصب سیاتیک

**دەماری سیاتیک**: ☜ **دەماری ڕەهێش**

▣ **دەمار دەرهاتن**: [کینایە] تێداچوون؛ بە یەکجاری لە ناو چوون ☰ دمار از روزگار درآمدن

**دەمار دەرهێنان**: [کینایە] لە ناو بردن ☰ نابود کردن

**دەماربەرز** / demarberz/: ئاوەڵناو. [مەجاز] لووتبەرز؛ فیزن؛ بەفیز و دەعیە. هەروەها: **دەماربەرزی** ☰ مُتکبر

**دەماردەر** / demarder/: ناو. ئازاری زۆر چەتوون ☰ آزار شدید

**دەمارزل** / demarzil/: ئاوەڵناو. [مەجاز] بەفیز؛ بەدەعیە؛ لووتبەرز ☰ مُتکبر

**دەمارفرۆش** / demarf(i)roş/: ئاوەڵناو. [مەجاز] بەفیز؛ لووتبەرز ☰ مُتکبر

**دەمارگرژ** / demargirj/: ئاوەڵناو. [مەجاز] ١. تووڕە؛ ناوچاو تاڵ ٢. لایەنگر و ڕکن لە سەر بابەتێک بێ لێکدانەوە و بەڵگە ☰ ١. عصبانی ٢. متعصب

**دەمارگرژی** / demargirjî/: ناو. [مەجاز] ١. تووڕەیی؛ ناوچاوتاڵی ٢. دۆخی لایەنگری و ڕک کردن لە سەر بابەتێک بێ لێکدانەوەی ڕاستی و دروستی بابەتەکە ☰ ١. عصبانیت ٢. تعصب

**دەمارناسی** / demarnasî/: ناو. بەشێک لە زانستی پزیشکی کە لە سەر ناسینی کۆئەندامی دەمار، نەخۆشی و تێکچوونی دەکۆڵێتەوە ☰ عصب شناسی

**دەمارەکوڵ** / demarekuł/: ☜ **دمارەکۆڵ**

**دەمارەکۆڵ** / demarekoł/: ☜ **دووپشك**

**دەمارەگەورە** / demaregewre/: ناو. شاڕەگ؛ شادەمار ☰ شاهرگ

**دەماری** / demarî/: ئاوەڵناو. سەر بە دەمار ‹شۆکی دەماری› ☰ عصبی

**دەماغ** / demağ/: ☜ **دەماخ**

**دەماغە** / demağe/: ناو. لووتکە ☰ دماغه

**دەمامک** / demamik/: ناو. ماسک: ١. ڕووبەند؛ پەچە؛ پێچە؛ پووشی؛ ڕووبەنە ٢. ئەوەی کۆستە، ڕووی پێ دەگرێ و خۆی پێ دەگۆڕێت ٣. ئەوەی دەم و لووتی پێ دەگرن تا کۆئەندامی هەناسەدان بپارێزێت ٤. کەرستەیێ کە کاتی کارکردن، دەم و چاو لە گەزن دەپارێزێ ☰ ١تا۴. ماسک

**دەمامەک** / demamek/: ناو. دواخ؛ ڕووبەند ☰ نقاب

**دەمان** / deman/: ناو. وەختان؛ زەمان ☰ زمان؛ اوقات

**دەمانچە** / demançe/: ناو. دەبانجە؛ دەبانچە؛ دەرمانجە؛ دەرمانچە؛ تەوانچە؛ وەروەر؛ چەکی گەرم و چکۆلە کە لە گیرفاندا جێی دەبێتەوە ☰ تپانچە

**دەماندن** / demandin/: چاوگ. تێپەڕ. //دەمانت؛ دەدەمێنی؛ بدەمێنە// دەمانن؛ دەمنای؛ فوودان؛ دەمدان؛ تووڕاندن؛ پفدان؛ با بەردانە شتێ یان شوێنێکەوە ‹شمشاڵ بە ناڵەی لەرە و لەرزەدار/ دەماندی کوورەی دڵی هەرزەکار «گۆران»› ☰ دمیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەدەماندن

**دەمانن** / demanin/: ☜ **دەماندن**

**دەمانە** / demane/: ناو. ماڵ؛ خانوو؛ جێی ژیان ☰

خانە؛ مسکن

**دەماودەم** / demawdem/: ئاوەڵکار. دەمبەدەم: ١. لە زار بۆ زار ‹ئەم چیرۆکە دەماودەم هاتووە› ٢. وەختاووەخت ‹دەماودەم تۆز و خۆڵ کەش دادەگرێ› ▣ ١. سینەبەسینە ٢. گاەبەگاه

▣ **دەماودەم چوون/ گەڕان:** بە شێوەی هەواڵ بڵاوە بوون ▣ دهان بە دهان گشتن

**دەماوەر** / demawer/: ئاوەڵناو. [مەجاز] دماوەر؛ دمپاراو: ١. وتەپاراو؛ قسەزان ٢. زۆربڵێ؛ چەنەباز؛ چەقەسرۆ ▣ ١. سخندان ٢. پرگو

**دەمباریک** / dembarîk/: ناو. جۆرێ ئەمۆردەست بە دوو پەلی باریک و درێژەوە ▣ دَمباریک

**دەمباز** / dembaz/: ☜ دەمتاک ـ١

**دەمبڕ**[1] / dembiř/: ئاوەڵناو. گۆترە؛ گۆترمە؛ بەراوردی ‹مامڵەی دەمبڕ› ▣ تخمینی

**دەمبڕ**[2]: ئاوەڵکار. ١. سەرزارەکی؛ بە قسە ٢. گۆترە؛ بە بەراورد ▣ ١. شفاهی ٢. تخمینی

**دەمبزێو** / demb(i)zêw/: ئاوەڵناو. [پلار] زۆربڵێ. هەروەها: دەمبزێوی ▣ وراج

**دەمبل** / dembil/: ناو. مێڵەیەکی کورت بە دوو گۆ یان پەڕەی هاوکێش لەم لا و لەو لاوە بۆ وەرزش ▣ دَمبل

**دەمبڵ** / dembił/: ئاوەڵناو. تور؛ تر؛ لالەپەتە؛ لالەپەترە؛ پتەلاڵە؛ پتەلاڵ؛ لالەک؛ پت؛ تت؛ بڕ؛ برە؛ زمانگران؛ زوانبەگیر ▣ الکن

**دەمبۆگەن** / dembogen/: ☜ دەقگەنی ـ١

**دەمبۆگەنیو** / dembogenîw/: ☜ دەقگەنی ـ١

**دەمبە پێکەنین** / dembepêkenîn/: ناو. ڕووخۆش؛ ڕووگەش؛ ڕوولکەن؛ ڕووکەن ▣ خوشرو

**دەمبەتاڵ** / dembetał/: ئاوەڵناو. ١. کەپن؛ بێددان ٢. [پلار] هەرزەوێژ؛ هەڵەوەڕ؛ کولەوێژ ▣ ١. بیدندان ٢. یاوەگو

**دەمبەدەم** / dembedem/: ئاوەڵکار. ١. ☜ دەماودەم ٢. هەمیشە؛ هەموو کات بێ پسانەوە ▣ ١. ☜ دەماودەم ٢. دمادم

**دەمبەدەمە** / dembedeme/: ☜ دەمەقرە

**دەمبەرەڵا** / dembereła/: ئاوەڵناو. [پلار] هەرزەبێژ؛ هەرزەدڕ؛ گەوجانەڕێس ▣ هرزەگو

**دەمبەس** / dembes/: ☜ دەمبێن

**دەمبەست** / dembest/: ☜ دەمبێن

**دەمبەڵ** / dembeł/: ☜ دمەڵ

**دەمبەهاوار** / dembehawar/: ئاوەڵناو. [کینایە] ١. تایبەتمەندی کەسێ کە قسەی بە لاوە ناوەستێ ٢. بێورە و ترسەنۆک کە لە هەموو شتێکدا هاواری بەرز دەبێتەوە ▣ ١. دهنلق ٢. جیقو

**دەمبێن** / dembên/: ناو. دمبێن؛ دەمبەس؛ دەمبەست؛ دەوبێن ▣ پوزەبند

**دەمپاراو** / demparaw/: ئاوەڵناو. [کینایە] قسەزان؛ دەمڕاست؛ زمانپاراو ▣ فصیح؛ سخندان

**دەمپاسکانی** / dempaskanî/: ☜ دەمەلاسکە

**دەمپاسکانێ** / dempaskanê/: ☜ دەمەلاسکە

**دەمپان**[1] / dempan/: ناو. دەمتەخت؛ جۆرێک ئەمۆردەست بە دەمی پان و درێژەوە بۆ قرتاندن ▣ لبتخت (نوعی انبُر)

**دەمپان**[2]: ئاوەڵناو. ١. دەمزل؛ زاردڕاو ٢. بە دەمەی پانەوە ‹پاچی دەمپان› ▣ ١. دهنگشاد ٢. لبەپهن

**دەمپایی** / dempayî/: ناو. مداس؛ چەکچەکیلە؛ سەرپایی ▣ دمپایی

**دەمپڕ** / dempiř/: ئاوەڵناو. سەرپڕ؛ دارماڵ؛ لیپ ▣ سرپُر

**دەمپوخت** / dempuxt/: ناو. چێشتێکە لە کفتە و کشمیش و لەتکەنۆک ▣ آشی محلی

**دەمپوڕ** / dempuř/: ناو. تفەنگی سەرپڕ ▣ تفنگ سرپُر

**دەمپووچ** / dempûç/: ئاوەڵناو. [مەجاز] دەمپووچەڵ: ١. بێددان ٢. [پلار] قسەنەزان ▣ ١. بیدندان ٢.

نافصیح

**دەمپووچەڵ** / dempûçeł/: ☜ دەمپووچ

**دەمپەڵووڵە** / dempełûłe/: ئاوەڵناو. [مەجاز] ١. بێ‌ددان کە جوان قسەی پێ ناکرێ ٢. قسەنەزان و گێژ ≡ ١. بی‌دندان که نمی‌تواند خوب حرف بزند ٢. ابله که درست حرف نمی‌زند

**دەمپیس** / dempîs/: ئاوەڵناو. [مەجاز] زمانپیس ‹... دەراوی دەمی ناخۆش بێ، دەمپیس بێ، جنێوفرۆش بێ، دەڵێن پیاوێکی زۆرزانە؛ لفت خۆش، گفت ڕەوانە؛ قسەی جوانە؛ کاری جوانە؛ شارەزای شارەزایانە «هەژار، چوار نامیلکە»› ≡ بددهن

**دەمتاک** / demtak/: ئاوەڵناو. ١. دەمباز؛ بە زاری کراوەوە ٢. [کینایە] دەمزل؛ کیفدەم ‹بوتری دەمتاک› ≡ ١. دهان‌باز ٢. دهان‌گشاد

**دەمتاڵ** / demtał/: ئاوەڵناو. [کینایە] قسەتاڵ؛ قسەڕەق؛ ڕاوێژناخۆش ≡ بدگفتار

**دەمتەخت** / demtext/: ☜ دەمپان[1]

**دەمتەڕ** / demteř/: ئاوەڵناو. [کینایە] ١. بەڵێندەری خۆڕایی ٢. زمانلووس ≡ ١. پُروعده‌ی بی‌عمل ٢. چرب‌زبان

**دەمتەڕکەرە** / demteřkere/: ناو. [کینایە] میوە و تەڕەکاری ≡ میوه و تره‌بار

**دەمتەڕی** / demteřî/: ناو. [کینایە] زمانلووسی؛ کلکەسووتێ ≡ چاپلوسی

**دەمتەشی** / demteşî/: ئاوەڵناو. [مەجاز] دەمتیژ و چەنەوەر ≡ ژاژخا

**دەمتەقێن** / demteqên/: ئاوەڵناو. [کینایە] چەنەباز ≡ پُرحرف

**دەمتەنگ** / demteng/: ئاوەڵناو. ڤیلک ≡ دهانه تنگ

**دەمتیژ** / demtîj/: ئاوەڵناو. [مەجاز] چەقەسرۆ ≡ پرحرف

**دەمتێوەدەر** / demtêweder/: ئاوەڵناو. [کینایە]

خۆتێ‌هەڵقورتێن ≡ فضول

**دەمجاو** / demcaw/: ☜ دەمەجاو-١

**دەمچۆم** / demçom/: ناو. دەمچەم؛ سەرچەم؛ بەستێن ≡ کناره‌ی رودخانه

**دەمچەپڵە** / demçepłe/: ☜ دەمشڕ

**دەمچەپەڵ** / demçepeł/: ئاوەڵناو. [مەجاز] زمانپیس ≡ بددهن

**دەمچەفت** / demçeft/: ☜ دەمچەوت

**دەمچەم** / demçem/: ☜ دەمچۆم

**دەمچەوت** / demçewt/: ئاوەڵناو. دەمچەفت: ١. زارخوار؛ دەملار ٢. [مەجاز] قسەنەزان ٣. [مەجاز] لە کار نەزان و گێلۆکە ≡ ١. کج‌دهان ٢. نافصیح ٣. ساده‌لوح

**دەمحیز** / demĥîz/: ئاوەڵناو. [مەجاز] سووک و فڕیێژ ≡ یاوه‌گو

**دەمخاو** / demxaw/: ئاوەڵناو. [کینایە] شل و ول لە قسە کردندا ≡ سُست گفتار

**دەمخوار** / demx(i)war/: ئاوەڵناو. قەوچ؛ دەم لار ≡ دهان‌کج

**دەمخۆش** / demxoş/: دەنگ. ئافەریم بۆ قسەی کردت ≡ احسنت

**دەمخۆشانە** / demxoşane/: ناو. مزگێنی خەبەری خۆش ≡ مژدگانی

**دەمداچەقاو** / demdaçeqaw/: ئاوەڵناو. [پەلار] دەمداچەقیو: ١. زارئاواڵەبوو؛ دەم تاک بووگ ٢. [کینایە] مردوو ≡ ١. دهان بازمانده ٢. مرده

**دەمداچەقیو** / demdaçeqîw/: ☜ دەمداچەقاو

**دەمدروو** / demd(i)rû/: ناو. دەمدوور؛ داوەبەنێ کە زارکی کیسە و جەوالی پێ درواوە ≡ نخ دردوزی

**دەمدڕێژ** / demd(i)rêj/: ئاوەڵناو. [پەلار] دەمدڕاو؛ دەمهەپک؛ دەمهەلار؛ زۆربڵێ؛ چەنەباز؛ چەقەسرۆ ≡ پُرگو؛ وراج

**دەمدڕاو** / demd(i)řaw/: ئاوەڵناو. [پەلار] ١. ☜

**دەمدرێژ** ٢. زمانشڕ ▣ ١. ☚ **دەمدرێژ** ٢. دهن‌لق

**دەمدوور** / demdûr/: ☚ **دەمدڕو**

**دەم ـ دەم** / dem dem/: ئاوەڵکار. گاـگا؛ جارـجار ‹ئاوی سوێری چاو و باری تاڵی لێو/ سوێر و تاڵی دەمدەم و ژەمژەم دەخۆم «نالی»› ▣ **گهگاه**

**دەمدەما** / demdema/: ئامراز. بەرەبەیانی؛ شەوەکی؛ بووڵێڵەی بەیان؛ کازیوەی بەیانی ▣ تاریک و روشن صبح

**دەمدەمان** / demdeman/: ☚ **دەمدەمانی**

**دەمدەمانی** / demdemanî/: ناو. دەمدەمان؛ دەمدەمانێ؛ ماچوموچ؛ کاری ماچ گۆڕینەوە ‹دەمەکەت بێنە دەمدەمانی کەم/ دەم و خاوەن دەم بە قوربانی کەم «فولکلور»› ▣ **ماچ و بوسه**

**دەمدەمانێ** / demdemanê/: ☚ **دەمدەمانی**

**دەمدەمو** / demdemû/: ناو. بەرماو؛ پاشماوە ▣ پسمانده

**دەمدەمی** / demdemî/: ئاوەڵناو. وازوازی؛ ئاوتاوی؛ دەمدەمیمەزاج؛ عەنتەرمەزاج؛ هەر وەختە لە سەر هەوایەک ‹مرۆی دەمدەمی، بەڵێن دەشکێنێ!› ▣ دمدمی

**دەمدەمیمەزاج** / demdemîmezac/: ☚ **دەمدەمی**

**دەمدەمێ** / demdemê/: ئاوەڵکار. ناوبەناو؛ ناوەناوە؛ جارجارێ ▣ **گاهگاهی**

**دەمرگە** / demirge/: ☚ **دەمەقڕە**

**دەمڕاس** / demřas/: ☚ **دەمڕاست**

**دەمڕاست**[1] / demřast/: ناو. *[مەجاز]* دەمڕاست؛ دەڤڕاست؛ دەمڕاس؛ کەسێ کە لە لایەن کۆمەڵ یان دامەزراوەیەکەوە قسە دەکا ‹دەمڕاست و مەلا بلا نەوەستن/ تاژدین و ستێ لە یەک ببەستن «هەژار، *مەموزین*»› ▣ **سُخنگو**

**دەمڕاست**[2]: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دەمڕاست؛ دەڤڕاست؛ دەمڕاس؛ نوێنەر ‹کوێخا دەمڕاست و داردەستی ئاغا بوو› ▣ **سخنگو**

**دەمڕووت** / demřût/: ئاوەڵناو. *[کنایه]* ١. بێموو؛ بێتووک؛ کوڕێژگەی هێشتا موو لێ دەرنەهاتوو ٢. کوڕی هێشتا بێژن ▣ ١. بی‌مو؛ امرد ٢. مُجرد

**دەمڕەش** / demřeş/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* قسەشووم؛ تایبەتمەندی کەسێ کە قسە و بەراوردی دەبێتە هۆی زەحمەت و زیانی خەڵک ▣ **شوم‌گفتار**

**دەمڕیشە** / demřîşe/: ناو. زیپکە و کوانی ناو زار ▣ زخم دهان

**دەمزل** / demzil/: ☚ **دەمتاک ـ٢**

**دەمژمێر** / demj(i)mêr/: ناو. کاتژمێر؛ سەعات ▣ ساعت

**دەمسارد** / demsard/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ١. قسەنەزان ٢. ناهومێد ٣. تایبەتمەندی تانجییەک کە دەرەنگ نێچیر دەگرێت ▣ ١. نافصیح ٢. ناامید ٣. تنبل (تازی)

**دەمسپی** / dems(i)pî/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* خێرخوای خەڵک ▣ **خیرخواه**

**دەمسوور** / demsûr/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ١. شەڕانی؛ جینگن ٢. بوێر و نەترس ٣. پێداگر؛ شێلگیر؛ پێچەقین؛ سوور لە سەر کار ▣ ١. ستیزەجو ٢. نترس؛ گستاخ ٣. مُصِر

**دەمسووری** / demsûrî/: ناو. *[پلار]* شەڕاشۆیی؛ نگنی ▣ ستیزەجویی

**دەمشڕ** / demşiř/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دەمچەپڵە؛ زوانشڕ؛ تێدانەوەستاو ▣ دهن‌لق

**دەمشیرینی** / demşîrînî/: ناو. ١. ڕێزانە؛ خەڵات بابەتی چاک ئەنجامدانی کارێ ٢. بەرتیل؛ هبوودی؛ ڕشفەت ▣ ١. انعام ٢. رشوه

**دەمقاڵی** / demqalî/: ☚ **دەمەقڕە**

**دەمقڕە** / demq(i)ře/: ☚ **دەمەقڕە**

**دەمقورس** / demqurs/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ڕازهەڵگر ▣ رازدار

**دەمکار / demkar**/: ناو. ١. کارێک بە تەنیشت کارێکی‌ترەوە ٢. دیمەنی دیواری قوڕ ☰ ١. کاری جنب کار دیگر ٢. نمای دیوار گلی

**دەمکانە / demkane**/: ☜ **دەموکانە**

**دەمکوت / demkut**/: ناو. [کینایە] دەمکوو: ١. سەرکۆنە؛ لۆمە ٢. کار و ڕەوتی بێ‌دەنگ کردن ☰ ١. سرزنش ٢. عمل وادار کردن به خاموشی

▣ **دەمکوت بوون:** [کینایە] قسە پێ‌نەمان؛ دەم دروون ‹زۆر بە توندی وەلامم داوە و دەمکوت بوو› ☰ چیزی برای گفتن نداشتن

**دەمکوت کردن:** [کینایە] بێ‌دەنگ کردن؛ قسە پێ نەهێشتن ‹زۆرێک لە دەولەتەکان ڕۆژنامەوانان دەمکوت دەکەن› ☰ وادار به خاموشی کردن

**دەمکوڵ / demkuł**/: ئاوەڵناو. دەم و لێو چکۆلە و جوان ‹شەوە لەو سەوزەزارە لەو دەم ئاوە/ مەکۆی خەم لاچووە دەمکوڵ چ ماوە؟ «هەژار، بۆ کوردستان»› ☰ غنچەدهن

**دەمکون / demkun**/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی کەسێ کە ددانی پێشەوەی کەوتبێ ☰ ویژگی کسی که دندان جلویی‌اش افتاده است

**دەمکۆ / demko**/: ☜ **دەمکوت**

**دەمکە / demke**/: ناو. دێبکە؛ دێمکە؛ کیسەی مشەما بۆ ئاو (تراو) ‹دەمکەیەک دۆ و دەسکە تەڕەپیوازێکم دەگەڵ خۆ هێنایەوە «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ کیسەی پلاستیکی برای حمل مایع

**دەمکەمچە / demkemçe**/: ناو. ١. کەوچکەقوڵە ٢. بەچکەبۆقی هێشتا بێ‌دەست و پێ ☰ ١. قاشق کوتاه ٢. نوزاد قورباغه

**دەمگاوس / demgawis**/: ئاوەڵناو. [کینایە، پلار] دەمزل ☰ دهن‌گنده

**دەمگرتە / demgirte**/: ناو. گەڕەلاوژە؛ گەڕەلاژە؛ کاری گۆرانی گوتنی تێکڕایی ☰ آوازخوانی دسته‌جمعی

**دەمگۆ / demgo**/: ☜ **دەنگۆ**

**دەمگە / demge**/: ☜ **دەم**[1]

**دەمگەرم / demgerm**/: ئاوەڵناو. [مەجاز] دمگەرم: ١. وتاربێژی چاک ٢. خێرا لە کەروێشک گرتندا (تاژی) ☰ ١. سخنور ٢. چالاک (تازی)

**دەمگەنکە / demgenke**/: ناو. کەڵکە؛ ڕووەکێکە لە نێو گەنمدا دەڕوێ و زیانی پێ دەگەیێنێ ☰ گیاهی است

**دەمگەنیو / demgenîw**/: ئاوەڵناو. [کینایە] دەمبۆگەن ☰ دارای دهنِ بدبو

**دەمگەوج / demgewc**/: ئاوەڵناو. [مەجاز] بێژەری قسەی نابەجێ و بێ‌تام ☰ یاوەگو

**دەمگیرفان / demgîrfan**/: ناو. تیزماڵکە پارچەیێ کە بە قەراخی زارکی گیرفانی پانتۆلدا دەیدروون ☰ نواری که دور جیب شلوار می‌دوزند

**دەملار / demlar**/: ☜ **دەمچەوت ـ١**

**دەملارە / demlare**/: ناو. تۆنگەڵەی ملخوار ☰ صُراحی گردن‌کج

**دەملە / demle**/: ناو. شەپلە؛ ئیفلیجی ☰ فالج

**دەملەپووش / demlepûş**/: ئاوەڵناو. [پلار] نامراد؛ نەوەکام؛ ناکام ‹لە ژیانێ دەمێننەوە کە چووشن/ بێچارە بە جارێ دەملەپووشن «هەژار، مەم و زین»› ☰ ناکام

**دەملەق / demleq**/: ئاوەڵناو. [پلار] زمان‌شڕ؛ تێ‌نەوێستاو؛ زاربلاو ☰ دهن‌لق

**دەممردوولە / demmirdûle**/: ئاوەڵناو. [کینایە] ١. تایبەتمەندی منداڵ یان بەرخێ کە هێزی مژینی نییە ٢. شەرمێون و قسەنەکەر ☰ ١. خصوصیت بچه‌ای که نمی‌تواند مُک بزند ٢. خجالتی

**دەمنای / demnay**/: ☜ **دەماندن**

**دەمنە / demne**/: ناو. ١. باسک؛ مۆدنە؛ دارسیغار ٢. پیکی زوڕنا ☰ ١. چوب‌سیگار ٢. جای لب در سُرنا

**دەمنەدەمانێ** / demnedemanê/: ناو. کار و ڕەوتی دەم نانە دەم و چەقە و هەرا کردن ☰ جدال لفظی

**دەمنـــەرم** / demnerm/: ناوەلـــناو. *[کینایـــە]* شیرین‌زمان؛ قسەخۆش ☰ شیرین‌زبان

**دەمنەسگار** / demnes(i)gar/: ناو. دەمنە؛ قۆسە ☰ چوب سیگار

**دەمنەوێسیاگ** / demnewêsyag/: ناوەلناو. *[پـلار]* زارشڕ؛ دەملەق؛ دەمدڕاو؛ قسەپەڕێن ☰ دهن‌لق

**دەمنێ** / demnê/: ناو. زەنبـووره؛ دارەکـونی ژێـر دۆلاش ☰ چوب سوراخ زیر ناو آسیا

**دەمواکـردە** / demwakirde/: نـاو. *[کینایـە]* کـاری شکاندنی ڕۆژوو؛ ڕۆژوو کردنەوە ☰ افطار

**دەموپل** / dem û pil/: ناو. *[مـەجاز]* ١. زرنگـی لـە کـاردا ٢. قســەڕەوانی ☰ ١. زرنگـی در کـار ٢. فصاحت

**دەموپلدار** / dem û pildar/: ناوەلناو. سەروزماندار؛ بە دەموزمان؛ بە توانا لە قسە کردندا ☰ سروزباندار

**دەموپوز** / dem û pûz/: ناو. پت‌وپووز؛ لچ و لێو ☰ ذک‌وپوز

**دەموچاو** / dem û çaw/: ناو. *[کینایە]* ڕوو؛ ڕوخسـار ☰ صورت

◘ **دەموچـاو شـۆردن:** *[کینـایی]* پێگـەیین (کـچ)؛ گەیشتنە کاتی مێرد کردن ☰ دمبخت شدن

**دەموچـاو هـەلگـرتن:** *[مـەجاز]* ڕوومــەت گــرتن؛ لابردنی مـووی دەم و چـاوی ژنـان ☰ اصـلاح کردن صورت زنان

**دەموچـاوگرژ** / dem û çawgirj/: ناوەلـناو. ڕووتـاڵ؛ ڕووتەحل؛ ڕووترش؛ ڕووگرژ ☰ اخمو

**دەموچاوهەلگر** / dem û çawhełgir/: نـاو. *[مـەجاز]* ڕوومەتگیر؛ ژنێ کە هەنیە هەڵدەگرێ ☰ زنی کە بند می‌اندازد

**دەمودوان** / dem û d(i)wan/: نـاو. قسـەڕەوانی ☰ قدرت بیان

**دەمودوو** / dem û dû/: نـاو. *[کینایـە]* دەمودوود: ١. دەموپل؛ دمودوو؛ قســەڕەوانی ٢. زرەنگــی ☰ ١. قوّت بیان ٢. زرنگی

**دەمودود** / dem û dûd/: ☚ **دەم و دوو**

**دەم و دەزگا** / dem û dezga/: ☚ **دامودەزگا**

**دەمودەس** / dem û des/: ناوەلـکار. دەمودەسـت؛ دەسبەجێ؛ هەرنهۆ ☰ فوراً

**دەمودەست** / dem û dest/: ☚ **دەمودەس**

**دەموڕاوێژخـۆش** / dem û řawêjxoş/: ناوەلـناو. زارخۆش؛ قسەخۆش؛ خوەش‌قسە ☰ شیرین‌سخن

**دەموڕوو** / dem û řû/: ناوەلکار. کشتکانی ☰ دمر

**دەموفلـچ** / dem û fiłç/: نـاو. *[پـلار]* دەموفلــق؛ دەموقەوچە؛ لچ و لێوی ناشیرین ☰ لب و لوچـەی زشت

**دەموفلق** / dem û fiłq/: ☚ **دەموفلچ**

**دەموقەوچە** / dem û qewçe/: ☚ **دەموفلچ**

**دەموکـاوێژ** / dem û kawêj/: نـاو. *[پـلار]* دەراوی دەم؛ شـێوەی قســە کــردن (زۆرتــر بــۆ ناحــەزی دەگوترێ) ☰ شیوەی سخن گفتن (بیشتر ناپسند)

**دەمولـەوس** / dem û lews/: نـاو. لـەپولـەوس؛ دەموفلچ ☰ لب‌ولوچە

**دەمولـەوس‌خوار** / dem û lewsx(i)war/: ناوەلـناو. خێس ☰ دهان‌کج

**دەمولێو** / dem û lêw/: ناو. لچولێو ☰ لب‌ولوچە

**دەمومس** / dem û des/: ناو. زاربەسـت؛ زاربەنـد ☰ دهان‌بند

**دەموش** / demûş/: نـاو. شیلەی شـتی شـیرین ☰ شهد

**دەموکانە** / demûkane/: نـاو. دمکانـە؛ دەمووکـە؛ دەمکانــە؛ دووکانــە؛ دۆکانــە؛ دیکانــە؛ دەنووکــە؛ دووکـا؛ دارخــوەرک؛ چەسپەلــۆک؛ ڕەوەکێکــی مشەخۆری هەمیشە سـەوزە لـە سـەر درەخـتی بەردار دەژی، ماکێکی ڕێزێنی لێ بەرهەم دێ کە

بۆ مەبەستی پزیشکی بە کار دێت ≡ دارواش

**دەموکە** / demûke/: ☜ **دەموکانە**

**دەموکەیەک** / demûkeyek/: ئاوەڵکار. هەڵی؛ تاوێک؛ ساتێ ≡ دمی؛ لختی

**دەمە** / deme/: ناو. ١. مووشەدەمەی ئاسنگر ٢. لێوی تیغ ٣. دەمنە؛ دەمنەسگار ٤. کزەبای ساردی سەر کێوان لە زستاندا ≡ ١. دمەی آهنگری ٢. لبەی تیغ ٣. چوبسیگاری ۴. باد سرد کوهستانی در زمستان

**دەمەت** / demet/: ناو. تووتنی وەلاشمی لە سەر یەک کۆگاکراو ≡ کُپەی توتون

**دەمەترشتە** / demetirişte/: ناو. ١. دەمەتەشوێ؛ دەمەترێشتە ٢. تۆلاشە؛ تیشیا ≡ ١. تیغەی تیشە ٢. تراشەی چوب

**دەمەترێشتە** / demet(i)rêşte/: ☜ **دەمەترشتە ـ١**

**دەمەتەشوێ** / demeteşwê/: ☜ **دەمەترشتە ـ١**

**دەمەتەقە** / demeteqe/: ☜ **دەمەتەقێ**

**دەمەتەقێ** / demeteqê/: ناو. *[سەرزارەکی]* دمەتەقە؛ دەمەتەقە؛ وتوویژی نێوانی دوو کەس ≡ گفتگوی دو نفره

**دەمەتێخەڵە** / demetêxełe/: ناو. چەقۆی دەسک شکاو ≡ چاقوی دسته شکسته

**دەمەجاو** / demecaw/: ناو. دمەجاو: ١. دەمجاو؛ ئەوەندە بنێشت بۆ جارێک خستنە دەم ٢. ☜ **دمجوو** ≡ ١. سقز به اندازه‌ی یک نوبت جویدن ٢. ☜ **دمجوو**

**دەمەچەشتە** / demeçeşte/: ☜ **دەمەچێشتە**

**دەمەچێشتە** / demeçêşte/: ناو. دمەچەشتە؛ دمەچێشتە؛ دەمەچەشتە؛ چەشتە؛ دانەخۆرە ≡ چشته‌خوار

**دەمەداچەقێ** / demedaçeqê/: ناو. *[پەلار]* دمەداچەقە؛ دەمەکوتێ؛ سەرەمەرگ؛ نزیکە مەرگ ≡ هنگام مرگ

**دەمەداس** / demedas/: ناو. دەمی پەڕیوی داس ≡ نُک شکسته‌ی داس

**دەمەدڕکی** / demediřkî/: ناو. دەمەکاوەکێ؛ دەمەکەوکی؛ باوێشک؛ ئاژاژکی ≡ خمیازه

**دەمەدۆ** / demedo/: ناو. ئاژەڵێ کە ڕایگرن بۆ شیرەکەی ≡ دام شیری

**دەمەدەم** / demedem/: ناو. سەرەتا ‹دەمەدەمی ئێوارە؛ دەمەدەمی بەهار› ≡ اوایل

**دەمەدەمە** / demedeme/: ناو. کێشە؛ شەڕەقسە؛ شەڕەدەندووکە ≡ جَدَل

**دەمەرقاجان** / demerqacan/: ☜ **دەمەرقاچان**

**دەمەرقاچان** / demerqaçan/: ناو. دەمەرقاجان؛ ئاگربازی بۆ شادی ≡ آتشبازی جشن‌ها

**دەمەرقۆپان** / demerqopan/: ☜ **دەمەقۆپان**

**دەمەڕیزە**[1] / demeřîze/: ناو. دەمەڕێزە؛ کەلی؛ شکاوی ≡ خدشه؛ خراش

**دەمەڕیزە**[2]: ئاوەڵناو. دەمەڕێزە؛ ژەنگاوی کرووچ (تیخ) ≡ زنگ‌زده‌ی لب‌پر (تیغ)

**دەمەڕێزە** / demeřêze/: ☜ **دەمەڕیزە**

**دەمەزەرد** / demezerd/: ئاوەڵناو. دمەزەرد؛ دەمەزەن؛ سەرنیا (گاوەسن). هەروەها: **دەمەزەرد کردن** ≡ مرمت شده (گاوآهن)

**دەمەزەردە** / demezerde/: ناو. بێچووی مەل کە هێشتا ڕەنگی زەردی دندووکی ماوە ≡ جوجه‌ی پرنده که هنوز نُکش زردی دارد

**دەمەزەن** / demezen/: ☜ **دەمەزەرد**

**دەمەژەنی** / demejenî/: ناو. کاری چەشتن بۆ تام کردن ≡ عمل چشته کردن

**دەمەسوو** / demesû/: ئاوەڵناو. دەمسواو ‹بۆ ئەوەی نەبوو تەشوێکەی ئەبەن/ ئەیوت ڕەنجەڕۆم دەمەسووی ئەکەن! «پیرەمێرد»› ≡ کُندشده

**دەمەشێر** / demeşêr/: ناو. گوڵێکە ≡ نوعی گُل

**دەمەقاڵە** / demeqałe/: ☜ **دەمەقرە**

**دەمەقالّی / demeqałî**/: ☜ دەمەقڕە

**دەمەقڕە / demeq(i)ře**/: ناو. *[سەرزارەکی]* دمەقالە؛ دمبەدمە؛ دەمبەدەمە؛ دەمقالّی؛ دەمقڕە؛ دەمرگە؛ دەمەقالە؛ دەمەقالّی؛ کێشە؛ دەڤژەنگ؛ دندووکە ▣ جَدَل

**دەمەقۆپان / demeqopan**/: ناو. دەمەرقۆپان؛ پانتۆلّی فاسۆن ▣ شلوار فاستونی کردی

**دەمەقەیچی / demeqeyçî**/: ناو. سەرەمقەست ▣ بازمانده از بُرش

**دەمەک / demek**/: ☜ دەمێ

**دەمەکوتێ / demekutê**/: ☜ دەمەداچەقێ

**دەمەل / demel**/: ناو. باپشکێو؛ چنچکەسلاوە ▣ گُل‌مژه

**دەمەلاسکە / demelaske**/: ناو. دەمەلاسکێ؛ دەمەلاسکی؛ دمەلاسکە؛ دمەلاسکێ؛ دەمهەلکی؛ لاسایی؛ لاساویێ؛ دەمپاسکانی؛ دەمپاسکانێ؛ دتەر؛ زارزارک؛ زارڤە؛ کەپوون ▣ ادا؛ تقلید

**دەمەلاسکی / demelaskî**/: ☜ دەمەلاسکە

**دەمەلاسکێ / demelaskê**/: ☜ دەمەلاسکە

**دەمەڵبێن / demełbên**/: ☜ دەمهەڵبەس-١

**دەمەنی / demenî**/: ناو. ئالامەت؛ هەلامەت ▣ زُکام

**دەمەونێوارە / deme w 'êware**/: ناو. باویشە؛ بەریوارە؛ تاڤزەرک ▣ دم غروب

**دەمەوخوار / demewx(i)war**/: ☜ دەمەونخوون

**دەمەوڕوو[1] / demewřû**/: ئاوەڵناو. دمەوڕوو؛ دەڤەروو؛ سەرنخوون؛ وەرگەڕاو ▣ واژگون

**دەمەوڕوو[2]**: ئاوەڵکار. دەڤەروو؛ دەمەوڕوو ▣ دَمَر

**دەمەوژوور / demewjûr**/: ئاوەڵناو. سەرەوژوور ▣ سربالا

**دەمەوژێر / demewjêr**/: ☜ دەمەونخوون

**دەمەونخوون / demewn(i)xûn**/: ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. دەمەوخوار؛ دەمەوژێر؛ سەرنخوون؛ وەرگەڕاو ▣ واژگون

**دەمەوەر / demewer**/: ئاوەڵناو. دمهەراش؛ دەمهەراش؛ دمهەلە؛ دەمهەلە ▣ حَرّاف

**دەمهار / demhar**/: ئاوەڵناو. *[پلار]* زۆر بەقسە و زۆربلێ ▣ حرّاف

**دەمهەپک / demhep(i)k**/: ☜ دەمدرێژ

**دەمهەراش / demheraş**/: ☜ دەمەوەر

**دەمهەلار / demhelar**/: ☜ دەمدرێژ

**دەمهەلکی / demhelkî**/: ☜ دەمەلاسکە

**دەمهەڵبەس / demhełbes**/: ناو. ١. دەمهەڵبەست؛ دەمەڵبێن؛ پەڕۆیەکە دەیخەنە سەر دەمی مردوو ٢. *[کینایە]* قسەی هەڵبەستە ▣ ١. وصله‌ای که بر دهان مُرده گذارند ٢. حرف من‌درآوردی

**دەمهەڵبەست / demhełbest**/: ناو. ١. ☜ **دەمهەڵبەس** ٢. کەسێ کە دەم و لووتی خۆی داپۆشیوە ▣ ١. ☜ **دەمهەڵبەس** ٢. کسی که ماسک زده

**دەمهەڵپێچ / demhełpêç**/: ناو. دمهەڵپێچ؛ دەسرەی بە دەم و لووتەوە پێچان ▣ دستمالی که بر بینی و دهان بندند

**دەمهەلە / demhele**/: ☜ دەمەوەر

**دەمی / demî**/: ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. زارەکی؛ دەڤکی ▣ شفاهی

**دەمیرە / demîre**/: ناو. سەڵتە؛ کولۆجەی مەلایان ▣ بالاپوش مُلایان

**دەمین / demîn**/: چاوگ. دەماندن ▣ دمیدن

**دەمێ / demê**/: ئاوەڵکار. دەمێک؛ دەمێو؛ دەمەک: ١. تاوێک؛ کاتێکی کەم ‹دەمێک ساقی دەمت بێنە! دەخیلی چاوەکانت بم/ بە جامێک دەستی من بگرە! فیدای پیری موغانت بم «وەفایی»› ٢. بڕێ جار؛ هێندێ جار؛ ناوبەناو ‹ئەدەب چی بکا لە یارانی؟ لە جەرگەی نازدارانی؟/ دەمێ خونخواری

بێباک و دەمێ غـەمخـواری جـارانن «ئـەدەب»› ٣. ڕۆژگارێکی دوور ‹سەری دانا لەسـەر رووی تـۆ، بـە شوێنی زولفی تۆدا چـوو/ وەفـایی ئـاخری خێـر بـێ دەمێکە بێسەروشـوێنە «وەفـایی»› 🇮🇷 ١. وقتـی ٢. گاهی ٣. دیرزمانی

**دەمێک / demêk/:** ☜ **دەمێ**

**دەمێکی / demêkî/:** ئاوەڵکار. گاڤـا؛ لەدەمـدا؛ لـە دەمێکا 🇮🇷 هنگامی

**دەمێو / demêw/:** ☜ **دەمێ**

**دەن[1] / den/:** نـاو. ١. پەراسـوو ٢. هـەرس؛ هـەزم؛ کاری هەڵتاواندن ٣. کووپەی گەورە 🇮🇷 ١. دندەی قفسەی سینە ٢. هضم ٣. خُم بزرگ

▪ **دەن[2]:** پاشەوشە. ـ گڤێر؛ ـ هەڵتاو؛ هـەرس‌کـردنی ‹دێردەن› 🇮🇷 ـ گوار

**دەنـا / dena/:** ئاوەڵـکار. ١. ئـەنا؛ ئـەگینا ‹نـەما «خانی» هەتا چیرۆکی عیشقی ئێمـە داڕێـژێ/ دەنـا هێشتا لە کوردستان دەژیـن «زیـن و مـەم»ێکـی‌تـر «هێمن»› ٢. مەگین؛ مەگەر 🇮🇷 ١. وگرنە ٢. مگر

**دەناچیە / denaçiye/:** ناو. لەگەز؛ لیچـار؛ مەتـەڵ؛ مەتەڵۆکە 🇮🇷 لُغز؛ چیستان

**دەناندن / denandin/:** چاوگ. هەڵتاواندن؛ هەرس کردن 🇮🇷 هضم کردن

**دەند / dend/:** ☜ **دەندە-١**

**دەندک / dendik/:** ناو. دەنک: ١. دەنـک؛ دانـەی هەر شت ٢. ناوکی میوە 🇮🇷 ١. دانە ٢. هستە

**دەندوکچە / dendukçe/:** ناو. جۆرێ هەنار 🇮🇷 نوعی انار

**دەندوک / dendûk/:** ناو. ١. ☜ **دندوك** ٢. نووکی تیژی هـەر شـتێ ‹سـەری فـەرهادم و دەنـدووکی قولنگ/ دەستی مەجنوونم و دامێنی چیا «نالی»› 🇮🇷 ١. ☜ **دندوك** ٢. نُک تیز هر چیز

**دەندوکدار / dendûkdar/:** ئاوەڵـناو. شـەندەلی 🇮🇷 دارای منقار

**دەندە / dende/:** ناو. ١. دەند؛ دونده؛ دەننە؛ جێی گاوەسن لە هێشەدا ٢. دەسگایەکی میکانیکی بۆ گۆڕینی جووڵە، لایەن و خێرایی لـە موتـوردا ٣. پەراسوو 🇮🇷 ١. جای گاوآهن در خیش ٢و٣. دنده

**دەندەل / dendel/:** ناو. پەراسووی پشت 🇮🇷 دنـدەی پُشت

**دەندەلوشک / dendelûş(i)k/:** نـاو. قانگەلاشـک؛ دڕووی وشکی کەنگر 🇮🇷 خار کنگر

**دەندی / dendî/:** ئاوەڵناو. شەتەک‌دراو؛ بە گـوریس بەستراو 🇮🇷 طناب پیچ

**دەنک / denik/:** نـاو. ١. پەراسوو ٢. ☜ **دەندك** 🇮🇷 ١. دندەی قفسەی سینە ٢. ☜ **دەندك**

**دەنکە / denke/:** ناو. ١. نـاوکی هێنـدێ میـوە ٢. چۆدان 🇮🇷 ١. هستەی میوە ٢. چاودار

**دەنکێ / denkê/:** ☜ **دانەیەك**

**دەنکێک / denkêk/:** ☜ **دانەیەك**

**دەنگ[1] / deng/:** ناو. ١. هەرچیک ببیسرێ ‹دەنگێ دێتە گوێم› ٢. خەبەر؛ هەواڵ ‹چ دەنگە؟› ٣. بـیر و ڕا؛ بیر و بۆچوون؛ بـڕوای زۆرینـە یـان هـەموو تاکگەلی لێژنە، کـۆڕ یـان کۆمەڵـگایەک ‹دەنـگ دان› ٤. زلە؛ دەنگەدەنگە ‹تا دەنـگ!› ٥. *[مەجاز]* هاوار، بەتایبـەت بـۆ بەرهەڵسـت بـوون ‹ئـاخری دەنگـی دەرهـات› ٦. *[مەجاز]* چۆنیـەتی دەنـگ ‹دەنگـی خۆشـە› ٧. *[مەجاز]* تـۆڕی هـەناردنی فرێکانسی ڕادیۆیی ‹دەنگی کوردستان› ٨. *[ڕێزمان]* ئەلف) وشەیێ کە شادی، تووڕەیی، سەرسووڕمان، وەڕەزی و ...ی بێژەر نیشان دەدا (وەک بەهـ ئاخ، پەکوو و...) ب) وشەیێ کە نیشـاندەری دەنگێکـە (وەک تەقەتەق؛ جیزە) ٩. *[زمانناسی]* هـەرکام لـەو نیشانە و پیتانەی کاتی دەربڕینیان لێو نابەسترێ و زمان بە دەم و ددانەوە نالکـێ (وەک: ۆ ـ ێ) 🇮🇷 ١. صدا ٢. خبر ٣. رأی ۴. سر و صدا ۵. فریاد ۶ لحن؛ صدا ٧. شبکەی رادیویی ٨. صوت ٩. مصوت؛ واکە

▣ **دەنگی بەرز:** دەنگیٚ بە هێز و قەوەتی زۆرەوە کە چاک ببیسریٚ ▬ صدای بلند

**دەنگی بەم/ بۆڵ/ کۆن:** دەنگی بە فرێکانسی کەمەوە (وەک: دەنگی تەپڵ) ▬ صدای بم

**دەنگی زێل/ زیک/ زیق/ تیژ:** دەنگ بە فرێکانسی زۆرەوە (وەک: دەنگی گۆرانیبێژی ژن) ▬ صدای زیر

**دەنگی گڕ:** دەنگی زل و کولفت (وەک دەنگی پیاو) ▬ صدای زِبر

**دەنگی نەرم:** دەنگی زوڵاڵ و خۆش ▬ صدای مخملی

▣ **دەنگ بڕین:** دەنگ داگۆڕین؛ دەنگ گۆڕین؛ دەنگ لیٚ گۆڕین؛ قسە دەگەڵ هەواڵ نەکردن ▬ قهر کردن

**دەنگ داگۆڕین:** ☜ **دەنگ بڕین**

**دەنگ دان:** ١. دەرخستنی بیر و ڕا لە هەڵبژاردندا ‹دەنگ دان بۆ سەربەخۆیی کوردستان› ٢. داکالیان؛ تیٚخوڕین؛ گوڕاندن ‹دەنگیان بدە با چیدی خراپکاری نەکەن› ٣. خەڵک وەدەرنان بۆ کاریٚ ‹ئەمڕۆ خەڵکی گوند دەنگ دە بۆ بێگار!› ▬ ١. رأی دادن ٢. نهیب زدن ٣. بسیج کردن

**دەنگ دانان:** دەنگ لە سەر فیلم و ... دانان ▬ صداگذاری کردن

**دەنگ دانەوە:** دەنگ ڤەدان: ١. شۆرەت کردن؛ بڵاو بوونەوەی خەبەر یان باسی شتێک ٢. گەڕانەوەی دەنگ ▬ ١. اشاعه دادن (خبر یا موضوعی) ٢. پژواک کردن

**دەنگ دڕان:** هەرا کردنی زۆر و بە قەو ▬ فریاد کردن با صدای بلند

**دەنگ دلێر بون:** *[کنایه]* قسە پیٚ بوون؛ لە باس و مەبەستێکی گونجاو پشتیوانی کردن ▬ حرف حساب داشتن

**دەنگ دەرچوون:** ١. قوو داکەفتن؛ خەبەر بڵاو بوونەوە ٢. وە دەنگ هاتن لە سەر شتیٚ ▬ ١. منتشر شدن خبر ٢. اعتراض کردن

**دەنگ دەرنەهاتن:** بێدەنگ بوون؛ متەق لیٚ نەهاتن ▬ جیک نزدن

**دەنگ دەرهاتن:** ١. لە تووڕەیی وە دەنگ هاتن ٢. بەرهەڵست بوونەوە ▬ ١. به فریاد آمدن ٢. صدا درآمدن؛ اعتراض کردن

**دەنگ دەرهێنان:** ١. بوونە هۆی بەدیهاتنی دەنگ ‹دەنگی سەیری لە خۆ دەردەهێنا› ٢. بوونە هۆی تووڕەیی و هەرا لیٚ هەستان ‹تا دەنگیان دەرنەهێنا، دەستیان هەڵنەگرت› ▬ ١. صدا درآوردن ٢. به فریاد آوردن

**دەنگ ڤەدان:** ☜ **دەنگ دانەوە**

**دەنگ کردن:** ١. گوتنی شتێک ٢. درکاندن؛ ئاشکرا کردنی نهێنی ٣. بانگهێشتن کردن ٤. بانگ کردن ▬ ١. ابراز کردن ٢. افشا کردن راز ٣. دعوت کردن ۴. صدا زدن/ کردن

**دەنگ کەوتن:** ☜ **دەنگ گیران**

**دەنگ گۆڕین:** ☜ **دەنگ بڕین**

**دەنگ گیران:** دەنگ کەوتن؛ دەنگ گیریان؛ دەنگ نووسان؛ دەنگ دەرنەهاتن لە بەر سەرما بوون یان زۆر قیڕاندن ▬ گرفتن صدا

**دەنگ گیریان:** ☜ **دەنگ گیران**

**دەنگ لە تێرییەوە دەرهاتن:** ☜ **دەنگ لە جێی گەرمەوە دەرهاتن**

**دەنگ لە جێی گەرمەوە دەرهاتن:** *[کنایه]* دەنگ لە تێرییەوە دەرهاتن؛ هەناسە لە جێگەی گەرمەوە هاتن؛ دارا بوون و قسەی وا کردن کە بۆ نەدار ناشیٚ ▬ صدا از جای گرمی درآمدن

**دەنگ لیٚکردن:** تیٚخوڕین ▬ نهیب زدن

**دەنگ لیٚگۆڕین:** ☜ **دەنگ بڕین**

**دەنگ نوسان:** ☜ **دەنگ گیران**

**دەنگ نێر بوون**: گڕ بوونی دەنگی کوڕ بە شێوەی سروشتی لە دەمی باڵغ بوونیدا 🇮🇷 بم شدن صدای پسر تازەبالغ

**دەنگ هاتن**: ١. دەنگ بە گوێ گەیشتن ٢. قرمەوقاڵ کردن ٣. /مەجاز/ شەڕ و داوا کردن 🇮🇷 ١. صدا آمدن ٢. سروصدا کردن ٣. دعوا کردن

**دەنگ هەڵبڕین**: دەنگ بلیند کردن؛ دەنگ بەرزەو کردن 🇮🇷 صدا را بلند کزدن

**دەنگ**[٢]: سارستە. فەرمان بە بێدەنگ بوون ‹ها دەنگ! ها دەنگ! دەنگی پۆڕ دێ/ خرنگەی خرخاڵ پەلکەشۆڕ دێ «فولکلۆر»› 🇮🇷 امر به سکوت

**دەنگان** / dengan/: ناو. ناوبانگ 🇮🇷 شُهرت

**دەنگبڕ** / dengbiř/: ناو. ئامێرێک بۆ کەم کردنەوەی دەنگ یان بێدەنگ کردن 🇮🇷 صداخفەکن

**دەنگبلند** / dengb(i)łind/: ئاوەڵناو. دەنگبەرز؛ دەنگزل 🇮🇷 صدابلند

**دەنگبۆڕ** / dengboř/: ئاوەڵناو. دەنگگڕ 🇮🇷 دارای صدای بم

**دەنگبەر** / dengber/: ☜ **دەنگبەرە**

**دەنگبەرز** / dengberz/: ☜ **دەنگبلند**

**دەنگبەرە** / dengbere/: ناو. دەنگبەر؛ دەنگەوەرە؛ ئامرازێ کە دەنگ بۆ دوور ڕادەگوێزێ 🇮🇷 صدابر؛ انتقال دهندەی صدا

**دەنگبێژ** / dengbêj/: ناو. دنگبێژ؛ قامبێژ؛ سترانڤان 🇮🇷 ترانەخوان

**دەنگخۆش** / dengxoş/: ئاوەڵناو. خۆشئاواز 🇮🇷 خوش‌آواز

**دەنگدار**[١] / dengdar/: ☜ **پیتی دەنگدار**

**دەنگدار**[٢]: ئاوەڵناو. ١. خاوەن دەنگ ٢. بەناوبانگ 🇮🇷 ١. داری صدا ٢. مشهور

**دەنگدەر** / dengder/: ناو. کەسێ کە ڕای خۆی لە هەڵبژاردنێکی گشتیدا دەردەخا 🇮🇷 رأی‌دهندە

**دەنگزل** / dengzil/: ☜ **دەنگبلند**

**دەنگژار** / dengjar/: ناو. نووزە لە قوڕگەوە 🇮🇷 نالەی خفیف

**دەنگکەوتوو** / dengkewtû/: ئاوەڵناو. دەنگنووساو 🇮🇷 گرفته (در مورد صدا)

**دەنگگڕ** / denggiř/: ئاوەڵناو. دەنگبۆڕ؛ دەنگزل 🇮🇷 دارای صدای بم

**دەنگگۆڕکێ** / denggořkê/: ناو. قار؛ کاری دەنگ بڕین 🇮🇷 عمل قهر کردن

**دەنگگیراو** / denggîraw/: ئاوەڵناو. دەنگنووساو؛ بە دەنگی نزم و ئاستەم لە بەر نەخۆشی یان هەر هۆیەکی تر 🇮🇷 صدا گرفته

**دەنگناسی** / dengnasî/: ناو. زانستی لێکۆڵینەوە لە بەدیهاتن، ڕێکخستن، ڕاگواستن، وەرگرتن و شوێنەمای دەنگ 🇮🇷 صوت‌شناسی

**دەنگنووساو** / dengnûsaw/: ☜ **دەنگگیراو**

**دەنگنێر** / dengnêr/: ئاوەڵناو. دەنگزبر و بەرز 🇮🇷 دارای صدای بلند و خشن

**دەنگوباس**[١] / deng û bas/: ناو. هەواڵ؛ خەبەر؛ باس‌وخواس 🇮🇷 خبر

**دەنگوباس**[٢]: سارستە. چ خەبەر؛ هەواڵ چییە ‹کاکە دەنگوباس؟ باشی شوکور؟› 🇮🇷 خبر

**دەنگوڕەنگ** / deng û řeng/: ناو. ڕادیۆ و تەلەڤیزیون 🇮🇷 صدا و سیما

**دەنگوفەنگ** / deng û feng/: ناو. پلەوقولە؛ ڕەوتانە 🇮🇷 دنگ‌وفنگ

**دەنگۆ** / dengo/: ناو. دەمگۆ: ١. قسەڵۆک؛ قاو؛ قاڵ؛ گوتە؛ گۆتە؛ واتە؛ واتۆ؛ واتوور؛ واتوورە؛ واتووڕی؛ وتوویر؛ بەنگوباو؛ بەندوباو؛ وتەوت؛ واتەوات؛ هەواڵێ کە سەرچاوەیەکی ڕوون و ئاشکرای نییە و بێ‌بەڵگەیە ٢. هەست 🇮🇷 ١. شایعە ٢. احساس

**دەنگە** / denge/: ناو. بانگ 🇮🇷 ندا

**دەنگەدەنگ** / dengedeng/: نـاو. ١. هەراهـەرای حەشامات ٢. دەنـگ و بـزاو؛ دەنگـی ئـازاردەری درێژخایەن 🇮🇷 ١. همهمه ٢. جاروجنجال

**دەنگەژە** / dengeje/: ناو. سـەرۆ؛ بـیر و هەسـتێک کە لە نادیارەوە بە دڵ دەگا 🇮🇷 الهام

**دەنگەشە** / dengeşe/: ناو. ١. هـەرا و هووریـا ٢. کاری بڵاو بوونەوەی خەبەر ‹دەنگەشـەی خـەباتی پێشمەرگە لە ڕۆژنامەکانی دنیـادا› 🇮🇷 ١. داد و فریـاد ٢. اشاعەی خبر

**دەنگەوەرە** / dengewere/: ☜ **دەنگبەرە**

**دەنگین** / dengîn/: ناوەڵناو. دەنگدار؛ بـەناوبانگ 🇮🇷 مشهور

**دەننە** / denne/: ☜ **دەندە ـ١**

**دەنوکە** / denuke/: ناو. موخوڕ؛ دەمووکانە 🇮🇷 دبق؛ مویزک

**دەنوک** / denûk/: ☜ **دندوک**

**دەنوکدار** / denûkdar/: ☜ **دندوکدار**

**دەنوکـە** / denûke/: نـاو. ١. ☜ **دەمووکانـــە** ٢. لەتەیەکی باریک لە ئێسک، پلاستیک؛ چێو یـان کانزا کە سازی ژێیداری پێ دەژەنن ٣. دندووکە؛ زۆپییەکی تەسک 🇮🇷 ١. ☜ **دەمووکانـە** ٢. زخمـە؛ مضراب ٣. بادامک

**دەنە** / dene/: ☜ **دەندە ـ٣**

**دەو** / dew/: ناو. ١. غار؛ ڕا؛ کاری ڕا کردن؛ بـەزین ٢. ☜ **دۆـ١** ٣. جۆرێ دابەش کردن، بەتایبەت نـان ٤. زار؛ دەم 🇮🇷 ١. دو ٢. ☜ **دۆـــ١** ٣. نـوعی تقسیم ۴. دهان

**دەو لێ خستن**: دابــەش کــردن؛ بــەش کردنــەوە ‹پاساری، قاژوو یا کۆتر یا کەو/ بەشێک و دوو بـەش، من لێی دەخەم دەو «حەقیقی»› 🇮🇷 تقسیم کردن

**دەوا** / dewa/: ناو. دەرمان 🇮🇷 دارو

**دەوات** / dewat/: ناو. دوێت؛ دەوێت؛ مەرەکەفـدان 🇮🇷 دوات

**دەواخ** / dewax/: نـاو. دەواغ؛ دەبـــاخ؛ هـــەلال؛ هەلالــچی؛ دەبــاخچی؛ دەبــاغچی؛ بــۆنگچی؛ چەرمچی؛ تێشوو؛ بۆنگ؛ چەرمگـەر؛ کەسـێ کـە پیشەی پاککردن و خۆشە کردنی پێستە 🇮🇷 دبّاغ

**دەواخانـە** / dewaxane/: نــاو. ١. دەرمانخانـــە؛ ئەجزاخانــە؛ دووکــانی دەرمــان فرۆشــتن ٢. دەباخخانـە؛ ئـەو شـوێنە هەلالـی تێـدا خۆشـە دەکرێ 🇮🇷 ١. داروخانە ٢. کارگاە دباغی

**دەوار** / dewar/: ناو. دەڤار: ١. بارەبـەری یەکسـم ٢. کـوێن؛ پارچـەی ڕەشمـاڵ ‹دەوار بـە شـۆردن چەرموو ناوێتەوە «مەسەل»› ٣. دوار؛ دووار؛ دەواو؛ ڕەشماڵ ‹کارێ کە خەم و دەردی فیراقت بـە مـنی کرد/ سەرما بە هەتیو، با بە دەواری شڕی ناکا «شـێخ ڕەزا»› ٤. وڵاغ و حــــەیوانی ڕاگــــرتن ‹دەوار سەوارێکی کەزن، وەک قانعی دڵ پڕ گەزن/ کناچە و باجی وەرخەزن، ڕەمایڕەمۆ ئەز داغ و هەم «قانع»› 🇮🇷 ١. ستور ٢. پارچەی سیاەچادر ٣. سیاەچادر ۴. چهارپای اهلی

**دەوارکەڵگ** / dewarkeł(i)g/: ☜ **دەوارەکەڵ**

**دەوارەکـەڵ** / dewarekeł/: نــاو. دەوارکەڵـــگ؛ پەڕەسیلکە؛ حاجیڕەش؛ حاجیڕەشک 🇮🇷 پرستو

**دەواساز** / dewasaz/: ناو. دەرمانســاز؛ دەرمانگـەر؛ کەسێ کە کاری تێکەڵ کردنی ماکی جۆراوجۆرە بۆ سازکردنی دەرمان 🇮🇷 داروساز

**دەواغ** / dewağ/: ☜ **دەواخ**

**دەوافرۆش** / dewaf(i)roş/: نـاو. دەرمــانفــرۆش؛ ئەجزاچی؛ کەسێ کە کـاری کـڕین و فرۆشـتنی دەوایە 🇮🇷 داروفروش

**دەوال** / dewal/: ناو. دزی شەوانە 🇮🇷 دُزد شبگرد

**دەواڵ** / dewał/: ناو. پەلە؛ لەز 🇮🇷 شتاب

**دەوام** / dewam/: ناو. ١. خۆڕاگری؛ ڕەوتی مانەوە؛ توانایی بەرەنگار بوونـەوە لـە بەرانبـەر تـەوەرە و هۆکاری زیاندەر و لەنێوبەرەوە ٢. کـار و ئـەرکی

ئیداری ‹دوای دەوام دەچمە مالی بـابم› ☰ ١. دوام ٢. کار اداری

▣ **دەوام بـوون/ هەبـوون:** ١. مانـــەوە ‹ئـەم کارانــە دەوامی نییە، یەک ـــ دوو ڕۆژێکـە› ٢. بـەردەوام بوونی کاری ئیداری ‹سبەینێ دەوامی فەرمییە و پشوو نییە› ٣. لـە سـەر کـاری ئیـداری بـوون ‹زەلامی وا هەیە چوار ڕۆژە دەوامـی نییـە› ☰ ١. ماندگار بودن ٢. تعطیل نبودن ٣. سرِ کار بودن

**دەوام هێنان:** ١. بڕ کردن ‹ئەم پەتە دەوام ناهێنێ، دەپســێ› ٢. مانـــەوە ‹لێــرە دەوام نــاهێنم، دەگەڕێمەوە زێدی خۆم› ☰ ١. مقاومت داشتن ٢. طاقت آوردن

**دەوان**[1] / dewan/: ☜ **دەبان**[1]

**دەوان**[2]: ئاوەڵناو. مـەزبووت؛ چوسـت؛ چـالاک ☰ چست و چالاک

**دەوانچە** / dewançe/: ناو. دەمانچە ☰ تپانچه

**دەوانە** / dewane/: ☜ **دۆدانە**

**دەواو** / dewaw/: ☜ **دەوار-٣**

**دەوبێن** / dewbên/: ☜ **دەمبێن**

**دەوخین** / dewxîn/: چاوگ. ١. بـێتاقـەت بـوون؛ بێلەش بوون ٢. خەرەفان؛ هورفیان؛ هـۆش لـێ بڕان ☰ ١. حال نداشتن ٢. خرفت شدن

**دەود** / dewid/: ☜ **دەیووس**

**دەودوو** / dewdû/: نـاو. لە دەیان دوو؛ بەشی ئاغا لە حاسلات ☰ دوعُشر؛ بهرەی مالکانه

**دەودەو** / dewdew/: ناو. باڵدارێکە ☰ پرندەای است

**دەور**[1] / dewr/: ناو. ١. خول؛ سوور؛ چەرخ؛ زڤـڕین ‹واژگوون دەورێ نوما من چەرخ و بایـێ لـەو لـەبان/ کەوکەبان سەیرا موخالیف گرت و تێکەل کر حیساب «مەلای جزیری»› ٢. دۆر؛ دۆرمادار؛ دەورانـدەور؛ پەڕانپەڕ؛ ئاقار ‹دەلـێی لـە دەوری دەسـت و پـێم/ ئەوەی کە تێل و تان و ڕایەلە، کەلەپچەیە «سـوارە»› ٣. *[زەویناسـی]* خـول؛ لـە دابەشـگەلی مێـژووی زەویناسـی، چەنـدێکیان دەبێتـە دەورەیـەک ٤. زەمانە؛ ڕۆژگار ‹لە دەوری ئێمـە هـەر خـوێنی دڵـە دەڕژێتە جامۆڵە› ٥. هەل؛ دەرفـەت؛ بـاو ‹بـەزمی هەزارە، قەلفری ئەغیارە، دەوری گـوڵ/ سـۆفی بـڕۆ! مەبە بە درک! تۆ لە ئێمـە نی «نـالی»› ٦. نـەخش؛ ڕۆڵ؛ هەرکام لە کەسایەتییەکانی نێـو شـانۆ یـان فیلم کـە شـانۆیار دەوری دەگێـڕێت ٧. کـارکرد ‹هەژار لە پێشڕەوتی زمان و وێژەی کـورد دەورێکـی بالای هەیـە› ٨. *[فەلسـەفە]* چۆنیـەتی بەنـدیواری و نیازمەندی دوو شت بە یـەکتر لـە بوونیانـدا، بـە جۆرێ کە هەرکام ئاکامی ئەوی دیکە بـێ (وەک: مریشک و هێلکە) ☰ ١. چـرخش ٢. پیرامـون ٣. دور زمین‌شناسی ۴. زمانه ۵. نوبت ۶ و ۷. نقش ۸. دور

▣ **دەور دان:** ١. هەموو لا لێ گرتن ٢. تێکۆشـین بۆ پێکهێنانی نیازێ ٣. گەڕان؛ خولخـواردن ☰ ١. مُحاصـره کـردن ٢. کوشـیدن بـرای عملـی ساختن مقصودی ٣. چرخزدن

**دەور دانەوە:** گەڕانەوە؛ هەڵەوگەڕیان ☰ دور زدن

**دەور کردنـەوە:** پێداچوونـــەوەی دەرس ☰ دوره کردن

**دەور گرتن:** چوارلا دان؛ چوارلا گـرتن ☰ احاطـه کردن

**دەور گـۆڕان:** زەمانــە گــۆڕان؛ گۆڕانکــاری لــە بارودۆخـدا ڕوودان ☰ روزگـار و شـرایط عـوض شدن

**دەور گێڕان:** دەور هەبوون؛ ڕۆڵ بیـنین ☰ نقـش بازی کردن

**دەور هەبوون:** ☜ **دەور گێڕان**

**دەور هەڵگرتن:** ١. تاو سـەندن؛ خێرایـی گـرتن ‹لەو بـەرەوخوارە، ماشـینەکە بـەر بـۆوە و دەوری هەڵگرت› ٢. *[مەجاز]* پای زیادە داکێشان ‹چییە دەورت هەڵـگرتووە؟ چ خەبـەرە؟› ☰ ١. سـرعت گرفتن ٢. دور برداشتن

**دەوری شتێ گرتن:** دەوروبەری شتێ داپۆشین 🇮🇷 اطراف چیزی را پوشاندن

**بە دەوری شتێکدا هاتن:** *[مەجاز]* لە خواردنێک باش خواردن ‹دۆڵمەمان بوو، هاتمە دەوریا!› 🇮🇷 خوراکی را درست و حسابی خوردن

**بە دەوری کەسێکدا هاتن:** *[مەجاز]* باش سزای کەسێک دانەوە ‹با بێمەو تێمە دەورتا!› 🇮🇷 حساب کسی را رسیدن

**لە دەوری کەسێک گەڕان:** قوربان و ساقەی کەسێک بوون ‹یا خوا لە دەورت گەڕێم! ئەم بارەم لە سەر شان لابە!› 🇮🇷 قربان صدقەی کسی رفتن

**دەور**[٢]: ئامراز. دەوری؛ لە دەوری ‹دەور دوو ساعەت ماتڵی بووین نەهات› 🇮🇷 حدودِ

**دەوران / dewran/:** ناو. ١. زەمانە؛ ڕۆژگار ‹با خاتر جە داخ دەوران شاد کەروون/ کۆگای خەرمانان خەم وە باد دەروون «سەیدی»› ٢. *[زەویناسی]* لە دابەشگەلی مێژووی زەویناسی، بڕێتی لە چەند دەورە 🇮🇷 ١. زمانە ٢. دوران زمین‌شناسی

**دەوران‌پشت / dewranpişt/:** ☜ **دەوراندەور**

**دەوراندەور / dewrandewr/:** ناو. دۆرمادار؛ دەوران‌پشت؛ چواردەور ‹بەردەممان دەشتی سەوزی شارەزوور/ شاخ گرتوویە لێی دەوراندەوری دوور «گۆران»› 🇮🇷 گرداگرد

**دەوران‌دەوران / dewrandewran/:** ئاوەڵناو. خاوەن خول؛ لە گەڕ ‹حەیف ئەڕای دنیا دەوران‌دەورانە «مەسەل»› 🇮🇷 در گردش و گذر؛ ناپایدار

**دەورتادەور / dewr ta dewr/:** ☜ **دۆراندۆر**

**دەورگێڕ / dewrgêř/:** ناو. ئەکتەر؛ شانۆیار 🇮🇷 بازیگر

**دەوروبەر / dewr û ber/:** ناو. کشت‌وکنار؛ دەوروپشت؛ دەوران‌پشت ‹پۆل ـ پۆل کچی شۆخ لە دەوروبەریان/ پیر بۆ دڵ و دینی خۆ دەگریان «هەژار، *مەم و زین*»› 🇮🇷 پیرامون؛ حوالی

**دەوروبەری / dewr û berî/:** ☜ **دەوری**

**دەوروپشت / dewr û pişt/:** ☜ **دەوروبەر**

**دەورودوکان / dewr û dukan/:** ناو. *[کینایە]* دام‌ودەزگا؛ نەزم‌ونیزام ‹بڕوانە تەنانەتی خوداوەند/ ئەم دەورودوکانە چۆن دەکا بەند «هەژار، *مەم و زین*»› 🇮🇷 دم‌ودستگاه

**دەورە / dewre/:** ناو. ١. خول؛ چەرخ ٢. زەمانە؛ ڕۆژگار ‹دەورەی خراپێ کەوتووین› ٣. *[زەویناسی]* لە دابەشگەلی مێژووی زەوین‌ناسی، چەند دەورە دەبێتە دەورانێک 🇮🇷 ١. دوره ٢. زمانە ٣. دورەی زمین‌شناسی

▣ **دەورە دان:** ١. چوارلا گرتن؛ دۆر گرتن ‹سپای غەم دەورەیان دام، دەس بە مەترەق/ لە پاش تەشریفی تۆ دامیانە بەر شەق! «شێخ ڕەزا»› ٢. تەقەلا دەگەڵ کەسێ دان بۆ پێک‌هێنانی نیازێ 🇮🇷 ١. احاطە کردن ٢. دور و بر کسی را گرفتن

**دەوری / dewrî/:** ناو. دۆری؛ قاپی پەل؛ دەفری نەقووڵ 🇮🇷 بُشقاب

**دەوری / dewrî/:** ئامراز. لە دەوری: ١. نێزیک؛ نزیک؛ دەور ‹دەوری دە کەس هاتبوون› ٢. دەوروبەری؛ لای؛ نێزیک بە ‹مالیان دەوری تووی مەلیکە، لە سلێمانی› ٣. لە نێزیک؛ لە دەور ‹دەوری یەک دانیشتبوون› ٤. دەوراندەور؛ پەڕانپەڕ ‹دەوری ئازادیان گرتووە، فریای کەوە!› 🇮🇷 ١. حدودِ ٢و٣. نزدیکِ ٤. پیرامونِ

**دەوریلێس / dewrîlês/:** ئاوەڵناو. *[کینایە]* هەستی‌کۆژ؛ زۆرخۆر؛ فرەخوەر 🇮🇷 پُرخور

**دەورێش / dewrêş/:** ☜ **دەروێش**

**دەورێش‌بالیک‌خۆر / dewrêşbalîkxor/:** ناو. دەورێش‌چووینە؛ تاژیلۆکە 🇮🇷 آخوندک

**دەورێش‌چووینە / dewrêşçûyne/:** ☜ **دەورێش‌بالیک‌خۆر**

**دەوژن** / dewjin/: نـــــــاو. دەوەژەن؛ دەوژەن؛ دەونیک؛ دەویک؛ دۆکەی ڕۆنی قاڵ‌کراو ▤ کف روی روغن تفته

**دەوژەن** / dewjen/: ☚ **دەوژن**

**دەوس** / dews/: ناو. شۆپ؛ شوێنی پێ ▤ رد پا

▣ **دەوس گرتن**: *[کنایە]* شوێن کـەوتن؛ چـاو بـڕین ‹وێ دەوسا بابێ خوە گرتی› ▤ پا جای پا گذاشتن

**دەوساندن** / dewsandin/: چاوگ. ١. پێ لێ نـان؛ پا پێدا نـان ٢. بـە زۆر پەسـتاوتن ▤ ١. لگـدمال کردن ٢. چپانیدن

**دەوسین** / dewsîn/: چاوگ. پێ لێ نـران؛ شـێلران ▤ لگدمال شدن

**دەوقانـــدن** / dewqandin/: نـــاو. دەویقانـــــدن؛ ئەزموونی هێلکـە بـە ددان بـۆ هێلکەشـکێنە ▤ امتحان کردن تخم مرغ با دندان

**دەوک** / dewk/: ناو. دۆکە؛ شۆکە؛ سـپیایی بـەلای سەوزایی ▤ سپیدک؛ آفت گیاهی

**دەوکیس** / dewkîs/: ناو. هەسـەی دوانـە؛ دۆی دە کیسە کراوی هەڵچۆڕاو ▤ دوغ کیسەای

**دەوگـــە** / dewge/: نـــاو. جۆلانـــــە؛ جۆلانـــــێ؛ داردێلەکانێ ▤ تاب

**دەول** / dewl/: ناو. ١. دۆڵچە ٢. گەلی؛ دۆڵ؛ شیو ▤ ١. دلو ٢. درّه

**دەولک** / dewlik/: ☚ **دۆڵچە**

**دەوڵ** / dewł/: ☚ **دەهۆڵ**

**دەوڵە** / dewłe/: ☚ **دۆڵ[١]ـ٣**

**دەوڵـەت** / dewłet/: نـاو. ١. حکوومـەت؛ کۆمەڵـە دامەزراوە و ڕێکخراوەیێ کە کاروباری وڵاتێکیـان بە دەستەوەیە ٢. دارایی؛ ماڵ و سـامان ٣. مـەڕ و ماڵات ▤ ١. دولت ٢. دارایی ٣. ثروت حیوانی

▣ **دەوڵەتی تاراوگە**: دەوڵـەتێ کـە لـە دەرەوەی وڵات بـە دەسـتی تـاراوێنراوان یـا پەنابـەران دامەزراوە ▤ دولت در تبعید

**دەوڵـەتی چەکداری**: دەوڵـەتێ کـە سـەرپەلانی ئەرتەش و هێزی چەکداری دایانمەزراندووە ▤ دولت نظامی

**دەوڵەتی کاتی**: دەوڵەتێ کە بـە هـۆی گـۆڕانی بارودۆخی سیاسی، پێش هەڵبژاردن و دەنـگ دان دانراوە ▤ دولت موقت

**دەوڵەتی کەمایەتی**: دەوڵەتێک کە بـە دەسـتی حیزبێکـی کەمینـەی سیاسـی و پتـر بـە هاوپـەیمان بـوون لەگـەڵ حیزبگـەلی تـردا دامەزراوە ▤ دولت اقلیت

**دەوڵـەتی گرووپفـد** *[پلار]* دەوڵـەتی ناپایـدار ▤ دولت مُستعجل

**دەوڵـەتی هاوپەیمان**: دەوڵـەتێ کـە ئەنـدامانی نوێنەرانی دوو یان چەنـد حیـزب یـان گـرۆی هاوپەیمانن ▤ دولت ائتلافی

**دەوڵەتـــداری** / dewłetdarî/: نـاو. ١. بەڕێتـــەرە؛ ئاژەڵداری ٢. حوکمەت؛ حکوومەت ▤ ١. دامداری ٢. حکومت

**دەوڵەتمەن** / dewłetmen/: ☚ **دەوڵەمەند**

**دەوڵەتمەند** / dewłetmend/: ☚ **دەوڵەمەند**

**دەوڵەتی** / dewłetî/: ئاوەڵناو. پێوەندیدار یان سەر بە دەوڵەت ▤ دولتی

**دەوڵەمەن** / dewłemen/: ☚ **دەوڵەمەند**

**دەوڵەمـــەنچلکن** / dewłemençiłkin/: ئاوەڵـــناو. تازەپێداکەوتوو؛ نۆکیسە ▤ نوکیسه

**دەوڵەمەند** / dewłemend/: ئاوەڵناو. دەوڵـەتمەن؛ دەوڵەتمەند؛ دەوڵەمەن؛ دارا؛ بوودە ▤ ثروتمند

**دەوڵەمەنـدی** / dewłemendî/: نـاو. دەســـداری؛ هەبوونی ▤ ثروتمندی

**دەون[١]** / dew(i)n/: ناو. دەڤی ▤ بوتەی جنگلی

**دەون[٢]**: ئاوەڵناو. ئاوداشتە؛ دێردراو ▤ آبیاری‌شده

**دەونیک** / dewnîk/: ☚ **دەوژن**

**دەوە** / dewe/: ناو. ١. دەبە؛ شلتاغ ٢. تەپاڵەی بـە

دەست دروستکراو 🇮🇷 ١. شلتاق ٢. تاپالەی با دست چلیده

**دەوەت** / dewet/: ☜ **داوەت**

**دەوە ـ دەوە** / dewe dewe/: ناو. یارییەکە بە دار و هەلووک دەکرێ 🇮🇷 از بازیها

**دەوەژەن** / dewejen/: ☜ **دەوژن**

**دەوەقولاخی** / dewequłaxî/: ناو. دەوەقولاغی؛ گیایەکە بۆ دۆکلیوی دێنن 🇮🇷 گیاهی برای دوغبا

**دەوەقولاغی** / dewequłağî/: ☜ **دەوەقولاخی**

**دەوەک** / dewek/: ناو. کەفی سەر دۆ لە مەشکەدا کە دەبێتە کەرە 🇮🇷 کف دوغ

**دەوەلان** / dewełan/: ناو. تەپاڵدان؛ قەلاغ؛ کۆشک ‹چ خۆشە خەوتن لە دەوەلانێ/ چزەی گۆشت بیستن لە ئاشپەزخانێ «هەژار، *چوار نامیلکە*»› 🇮🇷 مخزن تاپاله

**دەوەلەقووچ** / dewełeqûç/: ئاوەڵناو. ١. بێدەنگ ٢. زاربەستوو؛ دەمبەسیاگ ٣. هەژار؛ بەسەزوان 🇮🇷 ١. بی‌صدا ٢. دهان بسته ٣. بینوا

**دەوەن** / dewen/: ناو. دەوەند؛ دەوی؛ دەڤی؛ دەون ‹دەوەن ئاخر دەبێتە داری گەورە/ مەری لەڕ خدمەتی بۆ گۆشتی چەورە «حاجی قادر»› 🇮🇷 بوته‌ی جنگلی

▣ **دەوەن بەناش:** *[کینایە]* کێشە و هەرای بێفایدە 🇮🇷 مُجادله‌ی بیهوده

**دەوەنجاڕ** / dewencař/: ناو. شخەڵ؛ ئەشخەڵ 🇮🇷 زمین پُر بوته

**دەوەند** / dewend/: ☜ **دەوەن**

**دەوەنە** / dewene/: ناو. زی؛ دڕکەزی؛ دڕکێکە 🇮🇷 خاری است

**دەوەه** / deweh/: ناو. وشتر 🇮🇷 شتر

**دەوی** / dewî/: ☜ **دەوەن**

**دەویان** / dewyan/: چاوگ. سەح کرن؛ لێ ڕوانین و تۆژینەوەی شتێ یان شوێنێ، بەتایبەت تۆژینەوەی لەش یا بەشێک لە لەشی گیاندار بۆ دەرخستنی ئازار، نەخۆشی یان دڵنیایی لە ساخ بوونی 🇮🇷 معاینه کردن

**دەویت** / dewît/: ☜ **دەیووس**

**دەویقاندن** / dewîqandin/: ☜ **دەوقاندن**

**دەویک** / dewîk/: ناو. ١. دۆ ٢. شۆکە؛ دۆوک ٣. دەوژەن؛ دوەکی سەر ڕۆنی داغکراو 🇮🇷 ١. دوغ ٢. سپیدک ٣. کف روی روغن تفته

**دەوین** / dewîn/: ☜ **دۆکولیو**

**دەوێ** / dewê/: ئاوەڵکار. لەوێ؛ ئەوێ 🇮🇷 آنجا

**دەوێت** / dewêt/: ☜ **دەوات**

**دەوێدەرێ** / dewêderê/: ئاوەڵکار. چاگە؛ لەوێدا ‹دەوێدەرێ دەرکە بۆ هەموو مرۆیەکی ئازاد ئاوەلایە› 🇮🇷 در آنجا

**دەوێر** / dewêr/: ناو. یەکسم؛ ولاخەبەرزە 🇮🇷 ستور

**دەوێڵ** / dewêł/: ناو. زوێڵ؛ پارچەیەکی باریک لە چەرم 🇮🇷 نوار بُریده از چرم

**دەه** / deh/: ☜ **دە**[1]

**دەهبە** / dehbe/: ☜ **دەعبا**

**دەهدڵ** / dehdil/: ئاوەڵناو. پەشێو؛ دڵەودوا؛ دڵخورت 🇮🇷 نگران

**دەهدەه** / dehdeh/: ناو. وشەی دنە دانی ئەسپ بۆ خۆش ڕۆیشتن و غار دان 🇮🇷 کلمه‌ی تشجیع اسب به تاختن

**دەهری**[1] / dehrî/: ناو. ١. مرۆی لە دین دەرچوو ٢. ئەوی کە جیهان بە هەربوو و هەرماو و بێ ئافرێنەر دەزانێ 🇮🇷 ١. مُرتد ٢. دهری

**دەهری**[2]: ئاوەڵناو. دەیری: ١. لە دین دەرچوو؛ لە دین پەژیوان ٢. خوێنسارد؛ گوێبەهیچنەدەر ٣. پێچەقێن؛ سوور لە سەر مەبەست ٤. زۆر تووڕە 🇮🇷 ١. دهری ٢. لاأبالی ٣. لجوج ۴. بسیار خشمگین

**دەهل** / dehl/: ناو. دۆڵ؛ شیو 🇮🇷 درّه

**دەهندە** / dehinde/: ئاوەڵناو. دەهەندە؛ دلاوا ‹وە ناو

خودا کـە دەهەنـدە و دلۆڤـانە «هـەژار، قورئـان»› ☰ بخشنده

**دەهەندەیی** / dehindeyî/: ناو. سەخاوەت؛ دلاوایی ☰ بخشندگی

**دەهۆ** / deho/: ناو. ١. هۆڕ؛ جـاجمی هەڵـدرواو بـۆ دانەوێڵە ڕاگوێزان ٢. ☜ **دەهۆ**[١] ٣. فێڵ؛ دەسیسـە ‹ئێوە میراتگری کام جێ‌لەوەڕن؟ جاڕی کـام گـومبـوو ئەدەن؟ وا بە هەڵپە و بە دەهۆ «سوارە»› ☰ ١. جـاجیم دوخته برای حمل غله ٢. ☜ **دەهۆ**[١] ٣. دسیسه

**دەهـۆڵ** / dehoł/: ناو. دهـۆڵ؛ دەوڵ؛ نـەقرا؛ تەپڵـی گەورەی بەزم گێڕان ☰ دُهُل

⊡ **دەهـۆڵ دڕان**: *[کینایە]* ئابـڕوو چـوون؛ نـاو زڕان ☰ رسوا شدن

**دەهـۆڵ لـە ژێـر عابـاوە لـێ دان**: *[کینایە]* خـۆر بـە تۆپەقوڕ داپۆشـان؛ بـۆ شـاردنەوەی ڕاسـتییەک هەوڵی بێخۆ دان ☰ دُهُل زیر گلیم زدن

**دەهۆڵدان** / dehołdan/: ئاوەڵناو. *[پلار]* ورگن؛ زگـزل ☰ شکم گُنده

**دەهـۆڵدڕاو** / dehołd(i)řaw/: ئاوەڵـناو. نـاوزڕاو؛ ئابڕووتکاو ☰ رسوا

**دەهـۆڵژەن** / dehołjen/: نـاو. دۆڵئـەنگێو؛ دەهۆڵکوت؛ دەهۆڵ‌لێدەر؛ کەسـێ کـە دەهـۆڵ لێ‌دەدا ☰ دُهُل‌زن

**دەهۆڵکوت** / dehołkut/: ☜ **دەهۆڵژەن**

**دەهۆڵ‌لێدەر** / dehołlêder/: ☜ **دەهۆڵژەن**

**دەهە** / dehe/: ☜ **دە**[١]

**دەهەک** / dehek/: ☜ **دەیەك**

**دەهەم** / dehem/: ☜ **دەیەم**

**دەهەمین** / dehemîn/: ☜ **دەیەمین**

**دەهەندە** / dehende/: ☜ **دەهندە**

**دەهیەک** / dehyek/: ☜ **دەیەك**

**دەهێن** / dehên/: ناو. گیانداری سەیر و ناشـیرین ☰ جانور عجیب و بدشکل

**دەی**[١] / dey/: چاوگ. دان؛ داین ☰ دادن

**دەی**[٢]: نـاو. ١. دەنگ ٢. ☜ **دەیر** ☰ ١. صدا ٢. ☜ دەیر

**دەی**[٣]: ئاوەڵکار. ١. ئەدی ‹دەی نایەت!› ٢. بۆ درێـژە دان ‹دەی، دوایی؟› ☰ ١. خوب ٢. خوب؛ پس

**دەی**[٤]: ئامراز. وشەی بەرهەڵستی ‹دەی دەمەوێ بڕۆم؛ بەسیە دەی!› ☰ دیگر

**دەی**[٥]: دەنـگ. وشـەی دنـە دان ‹دەی گیانەکـەمی!؛ دەی لێدە!› ☰ کلمه‌ی تشجیع

**دەیای** / deyay/: ☜ **دڕان**

**دەیتا** / deyta/: ناو. دراو؛ زانیاری ☰ داده

**دەیدک** / deydik/: نـاو. هـالێن؛ جۆلانـەی منـاڵانی ساوا ☰ نَنو

**دەیدومـەک** / deydumek/: نـاو. باڵـندەیەکە لـە تۆرەمەی ڕەوڕەوە، نزیک ٣١ سانتی‌میترە، لە پێش چاویدا زیادە گۆشتێکی سوور خۆ دەنوێنێ، مـل و بـەر سـینگی ڕەش، لاجـانگی سـپی، دەنـدووکی سـوور، سـەری دەنـدووکی ڕەش و لاقـی زەردە، زیاتر بە جووت دەبینرێن لە قەراخ ئاوی شـیرین و کەشاوان دەژین ☰ دیدومک

**دەیـدەک** / deydek/: نـاو. دێلـەکانێ؛ داردلـەکانێ؛ جۆلانەی بە گوریسە ☰ تاب

**دەیدیک** / deydîk/: ناو. ١. لانک؛ دەرگوش؛ بێشکە ٢. جۆلانەی تێدا نووستنی منال ☰ ١. گهواره ٢. ننو

**دەیر** / deyr/: ناو. ١. دی؛ دەی؛ دێ؛ دێو؛ دێز؛ دێـە ؛ گیشەی گەلا و گیـا لـە سـەر داری لێـڕەوار بـۆ زستان ٢. پەرسـگا؛ پەرسـتنگا ☰ ١. تـودەی بـرگ خوراک زمستانی حیوانات ٢. دیر؛ معبد

**دەیری** / deyrî/: ☜ **دەهری**

**دەیز** / deyz/: ناو. گزرە ☰ گیاه کوبیده برای علوفـەی زمستانی

**دەیسا** / deysa/: ئامراز. سا؛ کە وا بـوو؛ کـە وایـە ☰ پس؛ بنابراین

**دەیشتواز** / deyştwaz/: ناو. بیاوان؛ یابان ☰ بیابان

**دەیک** / deyk/: ناو. دایک؛ دالک؛ داک ☰ مادر

**دەیلاخ** / deylax/: ناو. دەیلاغ؛ بەچکە وشتر ☰ بچە شتر

**دەیلاغ** / deylağ/: ☜ **دەیلاخ**

**دەیلەم** / deylem/: ناو. دەلەم؛ بێرەم؛ سەلنگ؛ چڵمێردە؛ مێلەیەکی ئاسنی بە سەرێکی پانەوە بۆ شکاندن و کون کردنی بەرد، دیوار و ... ☰ دیلم

**دەیم**[1] / deym/: ناو. دیم؛ دێم؛ دەیمەکار: ١. دێمەکاری؛ چەشنێک کشتوکاڵ کە ئاودێری تێدا نییە ٢. زەوینی شیاو بۆ کشتوکاڵ بە بێ ئاو ☰ ١. کشت دیمی ٢. زمین دیم

**دەیم**[2]: ئاوەڵناو. دیم؛ دێم؛ دەیمی؛ بە بێ ئاو ‹گەنمی دەیم؛ زەوی دەیم› ☰ دیم

**دەیمکێڵ** / deymkêł/: ☜ **دێمچێن**

**دەیمەڕوو** / deymeřû/: ناو. زەوینی دەیم ☰ زمین دیم

**دەیمەکار** / deymekar/: ☜ **دەیم**[1]

**دەیمی**[1] / deymî/: ئاوەڵناو. ١. دێمەکار؛ بەژک؛ پێوەندیدار بە دێمەوە ‹گەنمی دەیمی› ٢. ڕەمەکی؛ گۆترەیی؛ هەرەکی؛ هەیکۆ؛ بە بێ وردبوونەوە و تێفکرین ‹کاری دەیمی› ☰ ١و٢. دیمی

**دەیمی**[2]: ئاوەڵکار. بەگۆترە؛ ڕەمەکی؛ هەرەکی؛ هەیکۆ؛ بە شێوەی بێبەرنامە و بێ بیر لێ کردنەوە ‹دەیمی کار دکا› ☰ دیمی

**دەیمیلە** / deymîle/: ناو. دێمیلە؛ کەردرە؛ جۆرێ هەرزنی درشت ☰ نوعی ارزن درشت

**دەین** / deyn/: ناو. ١. وارە؛ وارە؛ قەرزداری ‹دەینی بە مل تۆ› ٢. سووچ؛ گوناه ‹لە ژێر دەینی سەگ و سووتکم› ☰ ١. بدهکاری ٢. گناه

**دەیندار**[1] / deyndar/: ناو. جۆرێ داری لێڕەوار ☰ نوعی درخت جنگلی

**دەیندار**[2]: ئاوەڵناو. قەرزار؛ قەرزدار؛ وامدار ☰ بدهکار

**دەینداری** / deyndarî/: ناو. قەرزداری؛ قەرزاری ☰ بدهکاری؛ وامداری

**دەیندک** / deyndik/: ناو. چەقالە بادام ☰ چغالە بادام

**دەیووس** / deyûs/: ئاوەڵناو. *[ناشیرین]* دویت؛ دەویت؛ دەود؛ بێناموس ☰ دیوث

**دەیە** / deye/: ناو. هەرکام لە بەشەکانی دە دانەیی کات ‹دەیەی سێهەمی-سەدەی بیستەم› ☰ دهە

**دەیەک** / deyek/: ناو. دەهەک؛ دەهیەک؛ لە دە پاژ، پاژێک ☰ عُشر؛ یکدهُم

**دەیەم** / deyem/: ئاوەڵناو. دەهەم؛ دەهەمین؛ بە پلە، ڕیز یان جێگەی دەوە ☰ دهُم

**دەیەمین** / deyemîn/: ئاوەڵناو. دەهەمین؛ بە پلەی دەهەمەوە ☰ دهُم

**دهار** / d(i)har/: ناو. دوند؛ چڵەپۆپە ☰ نقطەی اوج

**دهلک** / dihlik/: ناو. پشیلەی مێوینە ☰ گربەی مادە

**دهم** / dihm/: ناو. زەوینی بەیار ☰ زمین بایر

**دهمک** / dihmik/: ناو. دارێکی لێڕەوارە ☰ از درختان جنگلی

**دهن** / dihn/: ناو. ڕۆنی زەنگ/ قاڵ کراو؛ ڕۆن قرچیاگ ☰ روغن مُذاب

▣ **دهن دان**: *[کینایە]* دنە دان؛ هانە دان ☰ تشجیع کردن

**دهون** / d(i)hun/: ئاوەڵناو. چەور ☰ چرب

**دهۆ**[1] / d(i)ho/: ناو. دەهۆ؛ گزی و فێڵ و فەرەج ☰ نیرنگ

**دهۆ**[2]: ئاوەڵناو. وەڕەز و دووڵ ☰ پریشان و دودل

**دهۆل** / d(i)hol/: ☜ **دەهۆڵ**

**دهەڤدا** / d(i)hevda/: ئاوەڵناو. تێرگۆشتی جوانچاک ☰ تُپُلی

**دی**[1] / dî/: ناو. ١. دووکەڵ؛ دووکێڵ ٢. سۆمای چاو ٣. دێو؛ ئەوەی ناوی بەترسە ٤. ☜ **دەیر** ٥. کار و ڕەوتی ڕامان و ورد بوونەوە ☰ ١. دود ٢. بینایی ٣.

دیو؛ موجود ترسناک ۴. ☜ **دەیر** ۵. تأمُّل

**دی[2]**: ئاوەڵناو. تر؛ دیتر؛ ئیتر ‹کەم ـ کەم وارد بی وە بەندە مەنزڵ/ یەک ئوتاقی دی ساخت چینەی گڵ «شامی»› ≡ دیگر

**دی[3]**: ئاوەڵکار. ۱. ئەگینا؛ دەنا ‹تۆ خۆوەت بچوو! دی من تییەم› ۲. ئیتر؛ دیتر ‹یا فەراق ئاخر کوشیدم یا غەم ئەشعار نەو/ لەی دو دەردە ئەر نەمردم، دی نە لەرز دیرم نە تەو «شامی»› ≡ ۱. والّا ۲. دیگر

**دی[4]**: جێناو. ئیکە؛ تر ‹کەسی دی!› ≡ دیگر

**دی[5]**: دەنگ. دەی؛ وشەی هانە دان ‹دی هەستە!› ≡ دە؛ کلمەی تشجیع و تحریک

**دیا / d(i)ya/**: ناو. ۱. دایک؛ دالک ۲. کاری ڕوانین ۳. دیمەن؛ چاوئەنداز ≡ ۱. مادر ۲. تماشا ۳. منظره

**دیابێت / d(i)yabêt/**: ناو. نەخۆشی شەکر/ شەکرە/ قەن ≡ دیابت

**دیاپازون / d(i)yapazun/**: ناو. ئامێرێکی مووسیقایی بە دوو لقەوە (زۆتر کانزایی) کە ئەگەر لقەکان بلەرێنەوە دەنگێک بە فریکانسی دیاریکراوەوە بەدی دێ و لە کۆک کردنی سازدا کەڵکی لێ وەردەگرن ≡ دیاپازون

**دیاتی / d(i)yatî/**: ☜ **دیهاتی**

**دیار[1] / d(i)yar/**: ناو. ۱. سەر و سیما ۲. دیمەن؛ دیا؛ بەرچاڤک ۳. *[سەرزارەکی]* دیدار؛ دیمانە ٤. سەرزەوی؛ هەردوبووم ‹نەسیم وەس بویەر وە کۆساراندا/ وەسەن شانای وەڵگ وە دیاراندا «مەولەوی»› ≡ ۱. سروسیما ۲. منظره ۳. دیدار ۴. سرزمین

⊡ **دیار نەبوون**: دەس نەکەوتن؛ نەدیتران؛ دیدار دەس نەدان ‹هایتە کوێ؟ دیار نیت!› ≡ پیدا نبودن

**دیار[2]**: ئاوەڵناو. بەرچاو؛ ئاشکرا؛ بەدی؛ دیاردی؛ چۆنیەتی خویا بوون ≡ پیدا؛ آشکار

⊡ **دیار بوون**: ۱. لە بەرچاو بوون ‹مانگ گیرانەکە لێرەوە دیارە› ۲. ئاشکرا بوون ‹دیارە کارێکی بە دەستەوەیە!› ≡ ۱. پیدا بودن ۲. معلوم بودن

**دیار[3]**: ئامراز. نزیکی؛ جەم؛ لای ‹ماڵمان لە دیار یەک بوو؛ تاوێ تر ئەچمە دیار گاکانەوە› ≡ نزدِ

⊡ **دیار گرتن/ گردن**: هۆش پێوە بوون؛ چاودێری کردن ‹گاکان لە دەشتن، شەو تۆ بچۆ دیاریان بگرە!› ≡ مراقبت کردن

**دیاردە[1] / d(i)yarde/**: ناو. دیاردی: ۱. بەرچاوە؛ ئەوەی کە دەبیندرێ یان هەستی پێ دەکرێ ۲. ڕووداو؛ نۆڕسک؛ نووژەن؛ دابی تازە ۳. تەماڵ؛ کەروێشکی خۆ لە لاندا مەڵاس کردوو ≡ ۱و۲. پدیده ۳. خرگوش در لانه خوابیده

**دیاردە[2]**: ئاوەڵناو. بەرچاو؛ دیار ≡ آشکار

**دیاردەناسی / d(i)yardenasî/**: ناو. ۱. کار و ڕەوتی لێکدانەوەی ڕادەی گەشە کردنی ئاوەزی مرۆڤ وەکوو دەسپێک و بەشێک لە فەلسەفە ۲. کار و ڕەوتی پۆلێن کردنی دەستەیەک لە دیاردەگەل بە گوێرەی چەشن و جۆریان ≡ ۱و۲. پدیدەشناسی

**دیاردی[1] / d(i)yardî/**: ناو. ۱. ☜ **دیاردە[1]** ۲. کێشک؛ پاسەوانی شەوانە ≡ ۱. ☜ **دیاردە[1]** ۲. کشیک

**دیاردی[2]**: ☜ **دیاردە[2]**

**دیارناو / d(i)yarnaw/**: ناو. ناوی ناسراو ≡ اسم معرفه

**دیاری[1] / d(i)yarî/**: ناو. ۱. دەسەدیاری؛ سەوقات ‹دیاری شوان تاڵەکۆکە!› ۲. پێشکەشی؛ دەسایز؛ هەدیە؛ ئەوەی بۆ خۆشحاڵ کردن یا ڕێز لێنانی کەسێک پێشکەشی دەکرێت ≡ ۱. رەآورد ۲. هدیه

⊡ **دیاری دان**: ۱. سەوقات دان ۲. پێشکەشی دان ≡ ۱. سوغات بخشیدن ۲. هدیه دادن

**دیاری کردن**: ۱. نیشانە کردن؛ کردنە نیشانە ‹دارێکم دیاری کردبوو، لە گەڕانەوەدا گوم نەبم› ۲. دەرخستن بۆ بینین ‹وایان دیاری کردووە هەموو

کەس ببینێ› ٣. دەزگیران کردن و شیرنی خواردنی خوازبێنی ‹دوێنێشەو کچێکمان بۆ ئازاد دیاری کرد› ☰ ١. نشان کردن ٢. نشان دادن ٣. نامزد کردن

**دیاری**²: ئاوەڵناو. ١. بەرچاو؛ ئاشکرا؛ خۆیا ٢. پێشکێشی؛ خەڵاتی؛ پێشکەش کراو ☰ ١. آشکار ٢. پیشکشی

▣ **دیاری دان**: دەرکەوتن؛ هاتنە بەرچاو ‹مانگ ئەوا تازە دیاری دا› ☰ پدیدار شدن

**دیاریکراو** / d(i)yarîk(i)raw/: ئاوەڵناو. دەستەک؛ دەسەک ☰ نشانەشدە

**دیافراگم** / d(i)yafragm/: ناو. ١. گلێجە؛ پەردەی نێوان بۆشایی سینگ و زگ ٢. پەڕەیەک لە ئامێری وێنەگەری کە ڕادەی تیشک چوونە ژوور ڕادەگرێت ☰ ١و٢. دیافراگم

**دیالیز** / d(i)yalîz/: ناو. ١. شێوەی جیا کردنەوەی کلۆئیدگەلی ناو گیراوەیەک لە ماکی‌تر ٢. *[پزیشکی]* ڕەوتی پالاوتن و خاوێن‌کردنەوەی خوێن بە دەزگای تایبەت بۆ ئەوانەی گورچیلەیان لە کار کەوتووە یان ژار چۆتە لەشیانەوە ☰ ١و٢. دیالیز

**دیالێکتیک** / d(i)yalîktîk/: ناو. ١. *[مەنتیق]* بناشت؛ گلتە؛ شێوەی وتووێژ و دەمەقاڵەی مەنتیقی بۆ گەیشتنە ڕاستەقانی ٢. *[فەلسەفە]* بیرۆکەی فەلسەفەی گیئۆرک هیگل (١٧٧٠-١٨٣١ی ز.) کە بەو پێیە، بزاوی بیر لە ڕێگەی وتنەوەی تێز (هێم) و بە دەست هێنانی ئانتی‌تێز (بەرهێم/ دژهێم) ڕێ دەباتە سەنتێز (هەم هێم) و ئەنجامی مەنتیقی ٣. *[فەلسەفە]* بیرۆکەی فەلسەفی کارل مارکس (١٨١٨-١٨٨٣) کە بەو پێیە، ڕاستییەکانی جیهان لە سەر چوار بنەمای سەرەکی: گوران، هەڤگری دژگەل، ململانێی دژگەل و بازدان ☰ ١تا٣. دیالکتیک

**دیامان** / dîaman/: ناو. بیچم؛ تەشک؛ فەسال؛ سەکوت؛ سەروسیما؛ شکڵ و پێکهاتەی گیاندارێک ☰ ریخت

**دیان** / d(i)yan/: ☜ ددان

▣ **دیان چەرمگ بون**: ☜ ددان سپی بونەوە

**دیان کلێلە بون**: ☜ ددان چونە کلێلە

**دیان لە یەک چەرمگ بونەوە**: لە حاندی یەکدا هیچ شەرم و شوورەییەک نەمان ☰ شرم و ملاحظەای بین دو نفر نماندن

**دیان لێ‌تیژ کردن**: ☜ ددان تیژ کردنەوە

**دیاناژن** / d(i)yanajin/: ☜ داناژن

**دیان‌پزشکی** / d(i)yanpizişkî/: ☜ ددان‌پزیشکی

**دیان‌پزشک** / d(i)yanp(i)zîşk/: ☜ ددان‌پزیشك

**دیان‌ڕۆکڵە** / d(i)yanřokłe/: ☜ دانولە ـ١

**دیان‌ڕیچەکی** / d(i)yanřîçekî/: ☜ دنوڕیچە

**دیانساز** / d(i)yansaz/: ☜ ددانساز

**دیانە** / d(i)yane/: ناو. ددانە ☰ دندانە

**دیانەڕیکێ** / d(i)yaneřîkê/: ناو. دیانەکرە؛ دانەچیرە ☰ دندان‌قروچە

**دیانەکرە** / d(i)yanek(i)re/: ☜ دیانەڕیکێ

**دیانەکوڵانە** / d(i)yankułane/: ☜ دانولە ـ١

**دیانەکیرە** / d(i)yanekîře/: ناو. دیانەڕیکێ؛ دانەچیرە ☰ دندان‌قروچە

**دیای** / d(i)yay/: چاوگ. ڕوانین ‹دیای کەس نییەن نە هەوارگەی خەیل/ نە گا، نە گۆسفەند، نە چادر، نە لەیل «خانای قوبادی»› ☰ نگاه کردن؛ دیدن

**دیباچە** / dîbaçe/: ناو. دیواچە؛ سەرەتا؛ پێشەکی کتێب، بەتایبەت نووسراوە یان وتارێکی کورت لە هەوەڵی پەرتووکەوە ☰ دیباچە

**دیبەگ** / dîbeg/: ناو. دنگی گەورەی چەڵتووک ☰ دنگ بزرگ شالیکوبی

**دیپلوم** / dîplum/: ناو. ١. بڕوانامەی تەواوکردنی خوێندنی دواناوەندی (پاش‌ناوەندی) ٢. بڕوانامەی دوایی هێنانی خوێندنی دوکتوری ٣. پەڕەیەک کە تێدا سەرپشکیی یان شانازییەک بە کەسێک

دەدرێت ≡ ۱تا۳. دیپلم

**دیپلومات / dîplumat/**: ناو. ڕامیار؛ کەسێ کە پیشەی لە بواری سیاسەت و پێوەندی لەگەڵ وڵاتانیتردایە ≡ دیپلمات

**دیپلوماسی / dîplumasî/**: ناو. ڕامیاری و شێوازی پێوەندی نێوان دەوڵەتەکان ≡ دیپلماسی

**دیتبار / dîtbar/**: ئاوەڵناو. تەواو ئاشکرا ≡ هویدا

**دیتر / dîtir/**: ئاوەڵناو. تر؛ دیکە؛ دی ≡ دیگر

**دیتران / dîtran/**: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //دیترای؛ دەبینرێی؛ ببینرێ// بینران؛ کەوتنە بەر چاو ≡ دیده شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: دیتراو/ چاوگی نەرێنی: نەدیتران

**دیتن / dîtin/**: چاوگ. تێپەڕ. //دیتت؛ دەبینی؛ ببینە// بینین؛ چاو پێ کەوتن ≡ دیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ــ/ چاوگی نەرێنی: نەدیتن

**دیتنەوە / dît(i)newe/**: چاوگ. تێپەڕ. //دیتەوە؛ دەبینییەوە؛ ببینەوە// ۱. دۆزینەوە؛ پەیدا کردن ۲. دیسانەوە دیتن ≡ ۱. (باز)یافتن ۲. باز دیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ــ/ چاوگی نەرێنی: نەدیتنەوە

**دیتۆخ / dîtox/**: ئاوەڵناو. بینا ≡ بینا

**دیتۆک / dîtok/**: ئاوەڵناو. تازەپێداکەوتوو ≡ نوکیسه

**ــ دیتوو / -dîtû/**: پاشەوشە. دیدە ‹دنیادیتوو؛ خەمدیتوو› ≡ ــ دیده

**دیتی¹ / dîtî/**: ناو. منداڵی لە کۆڵان دۆزراوە ≡ کودک سرراهی

**دیتی²**: ئاوەڵناو. دنیادیە؛ چاوکراوە؛ گەڕیدە؛ خاوەن ئەزموون و ئاگاداری بە هۆی بەساڵاچوویی ≡ باتجربه؛ دنیادیده

**دیجامە / dîcame/**: ☜ دێوجامە

**دیجیتاڵی / dîcîtałî/**: ئاوەڵناو. ۱. خاوەن دەزگایێ بۆ وەرگرتن و ناردنی هەرچی پێ دراوە بە شێوەی ژمارەی سیفر و یەک بە نیشانەی بوون یا نەبوونی سیگناڵی ئەلکترۆنیکی ‹دووربینی دیجیتاڵی› ۲. بە شاشە یان دەزگای پیشاندان بە شێوەی ژمارە ‹سەعاتی دیجیتاڵی› ≡ ۱و۲. دیجیتالی

**دیدار / dîdar/**: ناو. ۱. سەر و سیما ۲. دیار؛ دیمانە؛ کار و ڕەوتی چاوپێکەوتن؛ دیتنی کەسێک بۆ وتووێژ یان پێوەندی ≡ ۱. سیما ۲. دیدار

⊡ **دیدار ناخر بوون**: مردن و لە دیتنی خۆشەویستان بێبەش بوون ≡ دیدار به قیامت شدن

**دیدم / dîdim/**: ناو. پەڕەسیلکە ≡ پرستو

**دیدە¹ / dîde/**: ناو. چاو؛ چەم؛ چەو؛ چەهڤ ≡ چشم

• **دیدە²**: پاشەوشە. دیتی؛ بەئەزموون ‹دەوراندیدە› ≡ ــ دیده

**دیدەکانی / dîdekanî/**: ناو. هەڵپەڕکێ؛ داوەت؛ دیلان ≡ رقص دستەجمعی

**دیدەن / dîden/**: ناو. ۱. دیدەنی؛ دیدار؛ دیەن؛ کاری چوونە چاو پێ‌کەوتن ۲. ڕێوڕەسمی چوونە دیداری بووک ≡ ۱. دیدنی؛ دیدار ۲. مراسم دیدار از عروس

**دیدەنمین / dîden(i)mîn/**: ئاوەڵناو. چاو فرمێسکاوی ≡ گریان

**دیدەنی / dîdenî/**: ☜ دیدەن ــ۱

**دیدەوان / dîdewan/**: ناو. ئێشکگری بان قەلا ≡ دیدبان

**دیدەوەر / dîdewer/**: ناو. پێش‌قەرەوڵ؛ پێشەنگ؛ سەیارە ≡ پیشقراول

**دیدی / dîdî/**: ناو. زڕدایک؛ باوەژن ≡ زن‌پدر

**دیر / dîr/**: ☜ دوور

**دیرادوور / dîradûr/**: ☜ دوورادوور

**دیربین / dîrbîn/**: ☜ دووربین

**دیردەس / dîrdes/**: ☜ دووردەست

**دیرۆک / dîrok/**: ناو. ۱. چیرۆک؛ ڕووداوی خەیاڵی ۲. ڕووداوی مێژوویی ≡ ۱. افسانه ۲. رویداد تاریخی

**دیرۆکڤــان** / dîrokvan/: نـاو. ١. چــیرۆکبێــژ ٢. مێژووبێژ ٣. مێـژووزان ☰ ١. افسانەخوان ٢. بازگو کنندەی رویدادهای تاریخی ٣. مورخ

**دیـرەک** / dîrek/: نـاو. دیـرەگ؛ دیـڕەگ؛ دیلـەک؛ تیرەک؛ کۆڵەکە؛ ستوون؛ ئەستوندەک ☰ ستون

**دیرەگ** / dîreg/: ☜ **دیرەك**

**دیڕەگ** / dîřeg/: ☜ **دیرەك**

**دیزداشە** / dîzdaşe/: ☜ **دزداشە**

**دیزک** / dîzik/: ناو. دەفری چێشـت تێـدا لێنـان ☰ دیزی

**دیزڵ** / dîził/: ناو. ١. موتـۆری دیزڵـی ٢. ماشـینێ کە موتۆرەکەی دیزڵییە ☰ ١و٢. دیزل

**دیزڵی** / dîziłî/: ئاوەڵناو. بە موتـۆری دیزڵـییەوە ☰ دیزلی

**دیزە** / dîze/: ناو. دەفری گڵی شـێو تێـدا لێنـان ☰ دیزی؛ دیگ گلی

◘ **دیـزە لـە دوو شـکاندن**: *[کینایـە]* دەرکـردنی بـە یەکجاری ملۆزم ☰ راندن مزاحم برای همیشه

**دیزەبەدەرخۆنــە** / dîzebederxone/: نـاو. *[کینایـە]* دیزەبەدەرخۆنە؛ کاری پۆشینی سڕ ‹ئەم قسە هەر لێرەدا دیزەبەدەرخۆنە دەکەین› ☰ سر به مُهر

**دیزەبـەکۆڵ** / dîzebekoł/: ناو. *[پلار]* کەسێ کـە لـە بەر ماڵ و دارایی زۆر ناوێرێ کۆچ بکا ☰ ثروتمنـدی کە دل مهاجرت ندارد

**دیزەلە** / dîzele/: ناو. چووزەلە؛ دووزەلـە ☰ مزمـار؛ نوعی آلت موسیقی

**دیزەڵۆکە** / dîzełoke/: ناو. دیزەڵە؛ کیتەڵە؛ دیـزەی چکۆلە ☰ دیزی کوچک

**دیزەڵە** / dîzełe/: ناو. ١. ☜ **دیزەڵۆکە** ٢. قـووڵایی پشت سمت ☰ ١. ☜ **دیزەڵۆکـە** ٢. گـودی بـالای باسن

**دیژلەمە** / dîjleme/: ☜ **دیشلەمە**

**دیژە** / dîje/: ناو. ڕەوشت؛ ئایین ☰ مذهب

**دیژەڵـە** / dîjełe/: ناو. گۆیژ؛ گێوژ؛ گفیشک؛ بلـچ ☰ زالزالک

**دیس**[1] / dîs/: ناو. قـاپ؛ لەنگـەری؛ دەفـری گـراران؛ دەفری گەورەی پان و پەل بـۆ خـواردن لـە سـەر دانان ☰ دیس

**دیس**[2]: ئاوەڵناو. توند پێکەوە نووسـاو؛ بـە سـەر یـەکا لکاو ☰ محکم به هم چسبیده

**دیسا** / dîsa/: ☜ **دیسان**

**دیسامبر** / dîsambir/: ناو. کانوونی یەکـەم؛ دوایـین مـانگی سالـی زایـینی کـە ٣١ ڕۆژە و لـە ١٠ی سەرماوەزەوە دەسپێدەکا ☰ دسامبر

**دیسان** / dîsan/: ئاوەڵکار. دیسا؛ دیسانەوە؛ دووبـارە؛ ئەمجاریش ‹ئەی وەتەن! دیسان بـەهارە و ئـارەزووی سـەیرانمە/ مـەیلی هـاژەی قەڵـبەزەی بـەفراوی کوێستانانمە «قانع»› ☰ باز؛ دوباره

**دیسانەکە** / dîsaneke/: ئاوەڵکار. ژنوو؛ گـڕ؛ دیسـان ☰ از نو

**دیسانەوە** / dîsanewe/: ☜ **دیسان**

**دیسک** / dîsk/: نـاو. ١. سـوێنە؛ تەشـتی قـوڕین ٢. کرۆژنەیەکی خرتۆڵ دە نێوان گازەرادا کە گوشاری سەر مۆرغە دەگرێتە خـۆ ٣. *[وەرزش]* ڕووپـەڕێکی جەغزی، زۆرتر لە چێو یان پلاسـتیک بـە کێشـی دوو کیلۆگرەم، بۆ تووڕ دان لە وەرزشێکی تایبەتـدا ٤. هـەر چەشـنە ڕووپـەڕی سـاف و جەغزئاسـا و بازنـەیی لـە ئـامێر و ماشـێندا ٥. پەڕەیـەکی پلاسـتیکی بازنـەیی بـۆ لـە خـۆ گـرتنی زانیـاری کەمپیوتەری ☰ ١. طشت سُفالین ٢تا ٥. دیسک

**دیسکۆ** / dîsko/: نـاو. دیسـکۆتیک؛ جێگایـەک بـۆ هەڵپەڕکێ، هاوڕێ لەگـەڵ بـەزم و هـەوای بـاوی ڕۆژدا ☰ دیسکو

**دیسکۆتیک** / dîskotîk/: ☜ **دیسکۆ**

**دیسـنەک** / dîsnek/: نـاو. نووسـەکە؛ نووسـەنەک؛ نووسنەک؛ دڕکێکە بە جلکـەوە دەنووسـێ ☰ خـار

گندمزار

**دیسۆ** / dîso/: ناو. کاری جووت بوونی گۆلە سەگ و دێڵەسەگ ⇐ جُفت شدن سگ نر و ماده

**دیسە** / dîse/: ناو. مەڕەکێوی؛ پەزی کۆڤی ⇐ گوسفند کوهی

**دیسپلین** / dîsîplîn/: ناو. ۱. ڕێکوپێکی؛ مرێسی ۲. بوارێکی دیاریکراوی زانستگایی ⇐ ۱. نظم ۲. دیسپلین

**دیش** / dîş/: ناو. ۱. ئامرازی کار ۲. کەلوپەلی ناو ماڵ ۳. ئانتینی ساجئاسای سەتەلایت ⇐ ۱. ابزار کار ۲. اثاثیەی منزل ۳. دیش

**دیشاڤ** / dîşav/: ☜ **دۆشاو**

**دیشاو** / dîşaw/: ☜ **دۆشاو**

**دیشلامە** / dîşlame/: ☜ **دیشلەمە**

**دیشلەمە** / dîşleme/: ناو. دیژلەمە؛ دیشلامە؛ چاییەک کە بە شەکر شیرین نەکرابێ ⇐ چای قندپهلو

**دیشەو** / dîşew/: ☜ **دوێشەو**

**دیغ** / dîğ/: ناو. خەت؛ دێڕ ⇐ خط

**دیغ ـ دیغ** / dîğ dîğ/: ئاوەڵناو. خەت ـ خەت ⇐ راه ـ راه

**دیفتری** / dîft(i)rî/: ناو. دووشاخە؛ پێران؛ وناخ ⇐ دیفتری

**دیفرانسیێل** / dîfrans(i)yêl/: ناو. ۱. *[ریازی]* دەزگایێ لە حسێبی دیفرانسیێلدا ۲. دەزگایێ لە ماشێن و بڕێک ئامێری موتوری دیکەدا کە لە چەن چەرخدەندە لە نێو جابەیەکدا پێکهاتووە و بە هۆی مێلگاردانەوە وەگەڕ دەکەوێ و بە دوو مێل پلۆسەوە جوولە دەخاتە چەرخەکان و بە هەر چەرخێ ڕێی خێرایی تایبەتی خۆی دەدا ⇐ ۱و۲. دیفرانسیل

**دیڤ**[1] / dîv/: ناو. ۱. کلک؛ دوو؛ دوڤک ۲. دووگ؛ دووگە ⇐ ۱. دُم ۲. دُنبە

**دیڤ**[2]: ئامراز. لە دوای؛ بە شوێن ‹دیڤ مندا وەرە!› ⇐ دنبالِ

**دیڤچوون** / dîvçûn/: چاوگ. بە دوادا چوون؛ شوێن گرتن ⇐ تعقیب کردن

**دیڤدیڤک** / dîvdîvik/: ناو. کرمی ڕیخۆڵە ⇐ کرم روده

**دیڤۆک** / dîvok/: ئاوەڵناو. هار و هاج؛ بزۆز؛ نەگونجاو ⇐ ناآرام

**دیڤەر** / dîver/: ☜ **دیوار ـ۱**

**دیڤەرە** / dîvere/: ☜ **دیوەرە**

**دیڤەلان** / dîvelan/: ئاوەڵناو. دیڤەلانک؛ دووڤدوڤک؛ هەمیشە لە دوو ⇐ پیگیرِ سمج

**دیڤەلانک** / dîvelanik/: ☜ **دیڤەلان**

**دیڤێن** / dîvên/: ناو. پێتەخت ⇐ پایتخت

**دیق** / dîq/: ناو. دێق: ۱. سیل؛ دەردەباریکە؛ ئازاری سی ۲. *[کنایە]* خەمی زۆر ⇐ ۱. بیماری دق؛ سل ۲. غم جانکاه

▣ **دیق دان:** *[کنایە]* تووشی داخ و کەسەری زۆر کردن ⇐ دق دادن

**دیق کردن:** *[کنایە]* لە بەر خەفەتی زۆر مردن ⇐ دق کردن

**دیقی دڵ هەڵڕژاندن:** *[کنایە]* داخ و کەسەری دڵ درکاندن ⇐ دق دل را خالی کردن

**دیقاوی** / dîqawî/: ناو. وەرەمدا؛ سیار؛ ژانازراڤکەتی ⇐ مسلول

**دیقدیقانێ** / dîqdîqanê/: ناو. سەرەتاتکێ ⇐ عمل دزدکی سر کشیدن

**دیقکوژ** / dîqkuj/: ئاوەڵناو. زووخاوکوژ؛ داخکوژ؛ تووشیاری مەرگ بە هۆی خەفەت خواردنی زۆرەوە ⇐ دقمرگ

**دیقل** / dîqil/: ناو. دیک؛ دیکل؛ کەڵەشێر؛ کەڵەباب؛ نێری مریشک ⇐ خروس

**دیقلۆک** / dîqlok/: ناو. دیکلۆک؛ باپشکێو؛

زیتکەسـلام؛ قنینچکەسـلام؛ چینچکەسـلاو ⇆ گُل‌مُژه

**دیقه . دیقه** / dîqe dîqe/: ↓

▣ **دیقه . دیقه دان:** دیقه ـ دیقه دانـەوه؛ شـت یـان دەسکەوتی خۆ لە پـێش بێبـەش ڕانـان و ئـازار دانی ⇆ حسرت دادن

**دیقه . دیقه دانەوه:** ☜ **دیقه ـ دیقه دانەوه**

**دیک** / dîk/: نـاو. ١. خـەڕەک ٢. ☜ **دیقـل** ⇆ ١. دوک ٢. ☜ **دیقل**

**دیکتـاتور**[1] / dîktatur/: نـاو. ملـهوڕ؛ لاسـار؛ سەرسەخت؛ کەسێ کە بە بێ ڕەچاو کردنی ڕای خەڵک و قانوون حکوومەت دەکا و ڕێ لە هەموو بیر و بۆچوونێک دەگـرێ ‹دیکتـاتوری رووس› ⇆ دیکتاتور

**دیکتاتور**[2]: ئاوەڵـناو. ١. لاسار؛ گوێ‌نـەدەر بـە بـیر و ڕای دیتـران ‹ئـەم بەرپرسـە زۆر دیکتـاتوره› ٢. تایبەتمەنـدی کـەس یـا حیزبێـک کـە هـەموو دەسەڵات پاوان دەکا ⇆ ١و٢. دیکتاتور

**دیکتاتوری** / dîktaturî/: ناو. لاسـاری؛ حوکوومـەتی تاکەکەسی یان تاقمێک بێ ئاوڕدانەوه لە بـیروڕای خەڵک ⇆ دیکتاتوری

**دیکل** / dîkil/: ☜ **دیقل**

**دیکلۆز** / dîk(i)loz/: ناو. جـۆرێ چێشـته ⇆ نـوعی آش

**دیکلۆک** / dîklok/: ☜ **دیقلۆك**

**دیکلەمـه** / dîkleme/: نـاو. کـاری خوێندنـەوەی بەرهەمێکی وێژەیی بە شێوازێکی هەست‌بزوێن ⇆ دکلمه

**دیکوپـاژ** / dîkupaj/: نـاو. دۆخـی دابـەش بـوونی فیلمنامه بە پێی بـەش و نماگـەلی جۆراوجـۆر ⇆ دکوپاژ

**دیکۆر** / dîkor/: نـاو. ڕازه: ١. کەلەبدون؛ ئـەوەی بـۆ خەملاندنی جێگایەک (وەک: شانۆ، دیـو، نووسـینگه و...) بە کار دێت ٢. پەرده یان قاپێکی گـەوره کـه وێنەی تێدا کێشراوه و بۆ ڕازاندنەوەی شانۆ بە کـار دێت ٣. شتێ کە تەنیا باری نمایشتی هەیـه و بـۆ بەدیهێنانی ڕوانینێکی تایبەت لە بینـەردا بـه کـار دێت ‹ئەم کتێبخانەیە دیکۆره و کـەس لێـرەدا کتێـب ناخوێنێ› ⇆ ١تا٣. دکور

**دیکۆراتۆر** / dîkorator/: ناو. ڕازێنکار؛ ڕازێنەر؛ ئەوی شوێنێک دەڕازێنێتەوه ⇆ دکوراتور

**دیکۆراسیون** / dîkoras(i)yun/: ناو. ١. زانسـت یـان هونـەری ڕازاندنـەوەی جێگایـەک ‹ئـارام کارناسـی دیکۆراسیونـی ناوەوەیـه› ٢. کـاری ڕازاندنـەوەی ناوەوەی ماڵ ‹دیکۆراسیونـی ماڵەکەت گۆڕیـوه؟› ٣. کەلەبدون؛ ڕازه؛ ئەوەی بۆ ڕازاندنەوەی سـەر شـانۆ بە کار دێت ⇆ ١تا٣. دکوراسیون

**دیکه** / dîke/: ئاوەڵکار. تر؛ دیتر ⇆ دیگر

**دیگه** / dîge/: ناو. دیزه ⇆ دیزی

**دیل**[1] / dîl/: ناو. ئێسیر؛ یەخسیر؛ کەسێ کە ئـازادی لێ گیراوه ‹چوار دیلـی سیاسی بەردران› ⇆ اسیر

**دیـل**[2]: ئاوەڵناو. ئێسیر؛ یەخسیر؛ گیرۆدەی بەند و داو یان دۆخێکی ناخۆش ‹ئەوێستا تۆ لەوێ دیلی دەسی بێگانەی و ئەمنیش/ لە دووری تۆ دەکێشم ڕەنج و دەرد و داخی بێ‌مرادی «هێمن»› ⇆ اسیر

**دیلاب** / dîlab/: ناو. دۆلاب؛ دۆلاب ⇆ دولاب

**دیلات** / dîlat/: ناو. داوەت ⇆ جشن عروسی

**دیلاڤ** / dîlav/: ناو. ڕێژگەی چۆم؛ شوێنێ کە ئاو بە خوڕەم دەڕژێتە ڕووبارەوه ⇆ مصب رودخانه

**دیلان**[1] / dîlan/: چاوگ. دەلان ⇆ تراویدن

**دیـلان**[2]: نـاو. ١. هەڵـپەڕکێ؛ داوەت ‹...دوێنـێ لـه داوەتی کاکی خۆ لە گەڕی دیلانێ، پشتێنم شل بوو له بەر خۆ بـادان و هـات و چۆیـه؛ لـه بـەر وێم دەخـزی «فولکلـۆر، پـایزه»› ٢. ☜ **دیلـەکـانێ** ⇆ ١. رقـص گروهی ٢. ☜ **دیلەکانێ**

**دیلان**[3]: ئاوەڵـناو. گێژ و دەبـەنگ؛ حـەپۆل ⇆ گـیج و

منگ

**دیلاندن** / dîlandin/: ☜ **دەلاندن**

**دیلانە** / dîlane/: ناو. دیلانێ؛ هەڵپەڕکێ؛ گۆبەند ☰ رقص گروهی

**دیلانێ** / dîlanê/: ناو. ١. ☜ **دیلانە** ٢. ☜ **دیلەکانێ**

**دیلباز** / dîlbaz/: ئاوەڵناو. دیلبلان؛ لەبلەبان: ١. قسەزان؛ زمانپاراو ٢. زۆربێژ؛ چەنەوەر ☰ ١. سخندان ٢. پُرگو

**دیلبان** / dîlban/: ئاوەڵناو. *[کنایە]* زمانتەڕ؛ زمانباز؛ زمانلووس ☰ چرب‌زبان

**دیلبلان** / dîlb(i)lan/: ☜ **دیلباز**

**دیلبەند** / dîlbend/: ☜ **دیلماج**

**دیلدیلە** / dîldîle/: ناو. شات؛ دارێکە، تەگەرێکی چکۆلەی پێوە دەبەستن، منداڵ یاری پێ دەکا ☰ نوعی اسباب‌بازی

**دیلم** / dîl(i)m/: ☜ **دیلەم**

**دیلماج** / dîlmac/: ناو. دیلمانج؛ دیلبەند؛ تەرجمان؛ پاچڤەکار ☰ مُترجم

**دیلمار** / dîlmar/: ناو. جۆرێ مارمێلکەی درێژ ☰ نوعی مارمولک

**دیلمانج** / dîlmanc/: ☜ **دیلبەند**

**دیلندێز** / dîlindêz/: ناو. دێرندێز؛ جەژنێکی زستانەی فەلانە، ئاگر دەکەنەوە ☰ از اعیاد مسیحیان

**دیلوان** / dîlwan/: ☜ **دلیوان**

**دیلۆک** / dîlok/: ناو. سترانی داوەتێ؛ گۆرانی بۆ هەڵپەڕکێ ☰ آهنگ ضربی

**دیلۆکڤان** / dîlokvan/: ناو. لۆتی؛ گۆرانیبێژی داوەتێ ☰ خوانندەی عروسی

**دیلە** / dîle/: ناو. قورم؛ سیان؛ دوودە ☰ دوده

**دیلەک** / dîlek/: ناو. ١. مەدەر؛ شەفات؛ تکا؛ کار و ڕەوتی پاڕانەوە لە کەسێک بۆ چاوپۆشی کردن لە گوناهی کەسێکی تر ٢. ☜ **دیرەك** ☰ ١. شفاعت ٢. ☜ **دیرەك**

**دیلەکان** / dîlekan/: ناو. جۆلانەی گوریس ☰ تاب

**دیلەکانێ** / dîlekanê/: ناو. داردیلەکانێ؛ داردێلەکانێ؛ داردوولەکان؛ داردلەکانێ؛ دارلەکانێ؛ دەلەکانێ؛ دێلەکانێ؛ دیدەکانێ؛ دیلان؛ دیلانێ؛ داردوولەکان؛ دەیدەک؛ دیدەک؛ جۆلانە؛ جۆلانێ ☰ تاب‌بازی

**دیلەکچی** / dîlek(i)çî/: ئاوەڵناو. تکاکار ☰ شفیع

**دیلەم** / dîlem/: ئاوەڵناو. دیلم؛ تەمەڵ؛ تەپ؛ کەهاڵ ☰ تنبل

**دیلی** / dîlî/: ناو. بەندیەتی؛ گیراوی؛ ژێرچەپۆکی ‹با لە خودا بلاڵینەوە کە «شامی»ش و خزم و کەسی هاوڕەسەنی لە ژیانی دیلی و زەلیلی و هیچنەبینی و بێماڵی و کرانشینی ڕزگار بن و ... «هەژار، پێشەکی چەپکەگوڵ»› ☰ اسارت

**دیلیەتی** / dîlyetî/: ناو. هێشیرێنی؛ یەخسیری ☰ اسارت

**دیم** / dîm/: ناو. ١. ☜ **دەیم** ٢. دەموچاو؛ ڕوخسار ٣. ڕوومەت؛ کوڵمە؛ کولم ٤. ڕوو؛ لا؛ ڕەخ؛ ئالی ٥. دیو؛ ژوور؛ وەتاغ ☰ ١. ☜ **دەیم** ٢. صورت؛ چهره ٣. گونه ٤. طرف ٥. اتاق

**دیماتی** / dîmatî/: ناو. دیمانی؛ ئاکنجێتی؛ نیشتەجێیی؛ گلەوبەری؛ کار و ڕەوتی جێ خۆش‌کردن و مانەوە لە شوێنێک ☰ اقامت

**دیمان** / dîman/: ☜ **دیمانە**

**دیمانە** / dîmane/: ناو. دیمان: ١. وتوویژ ٢. کار و ڕەوتی چاو پێ‌کەوتنەوەی دۆست ‹دیمانەت بەخێر یەکەم داربەڕوو/ گابەردی لاڕێی لاڵ و پاڵ کەوتوو «گۆران»› ☰ ١. مُصاحبه ٢. دیدار

**دیمانی** / dîmanî/: ☜ **دیماتی**

**دیمبڵیدیمباو** / dîmb(i)ľdîmbaw/: ناو. *[پلار]* دمبڵیدمباو؛ دمبلیدمباو؛ دەنگی ژەندنی چەن سازی مووسیقا ☰ دالامبودولومب

**دیموکرات** / dîmukrat/: ئاوەڵناو. ١. هۆگری ڕژیمی دیموکراسی ٢. ئەندام یان هۆگری حیزبی دیموکرات (لە وڵاتانی جۆراوجۆردا) ☰ ١و٢. دموکرات

**دیموکراسی** / dîmukrasî/: ناو. ١. سیستەمێک کە تێیدا هەر تاکێکی کۆمەڵگا مافی هەیە ئازادانە بیر و ڕای خۆی دەربڕێ و لە هەل و بەرهەم و کار و ئەرکی ئەو کۆمەڵگایە بەشدار بێ ٢. گەلمیری؛ نیزامێکی سیاسی کە کاربەدەستانی حکوومەت لە لایەن خەڵک یان نوێنەرانیانەوە هەڵدەبژێردرێن و لە هەمبەریانەوە بەرپرسن ٣. گەلمیری؛ یەکەیێکی سیاسی وا کە تێیدا دەنگی زۆرینە ڕاژۆرە ☰ ١تا٣. دموکراسی

**دیمە** / dîme/: ناو. ١. دیم؛ ڕوخسار ٢. سەرکوڵمە ٣. ڕووکێش ☰ ١. رُخسار ٢. گونه ٣. روکش

**دیمەشۆر** / dîmeşor/: ☜ **دیمەشۆرە**

**دیمەشۆرە** / dîmeşore/: ناو. دیمەشۆر؛ ڕیشۆڵەی حەمام؛ ماکێکی سپییە، لە گڵەسپی چێ دەکرێ، ژنان لە حەمام خۆی پێ دەشۆن ☰ روشوره

**دیمەک** / dîmek/: ناو. ١. داری ناو دیوار بۆ قایمی ٢. دەندە؛ جێگەی گاسن لە ئامووردا ☰ ١. چوب لایەی دیوار ٢. جای گاوآهن در خیش

**دیمەن** / dîmen/: ناو. ١. دیا؛ چاوەناز؛ بەرچاڤک؛ وەرەچەم؛ ئەوەی لە پێش چاودایە ‹لە لایەک باسکی هەڵماڵیوە بێری، مەڕ دراوە بێر/ دەبینی دیمەنی وا جوان لە ناو بازاڕی پڕئازار «هێمن»› ٢. وێنەی لە دوورەوەی سروشت ‹دیمەنی بەهاران› ٣. دیامان؛ ڕوانگە؛ بەرجەوەن؛ بەرژەوەند؛ شوێنی لێوە ڕوانین ‹چ کەڵوە و چ سیروان و ئاوێژەڕۆیە/ بە دیمەن هەمووی شۆخ و شەنگتر لە تۆیە «هەژار، بۆ کوردستان»› ٤. دیم؛ سیما؛ ڕوخسار ‹لەگەڵ ئەوەی لە عاباوە ئالابوو/ لە دیمەنی شیرینی ئاشکرا بوو «گۆران»› ☰ ١و ٢. منظره ٣. منظر ٤. رُخسار

**دیمەنجوان** / dîmenc(i)wan/: ئاوەڵناو. دەشە؛ بەدیمەن ☰ خوش‌منظر

**دین**[١] / dîn/: چاوگ. ١. مناڵ بوون ‹دوو کوڕی بە زگێک دیوە› ٢. دیتن؛ چاو پێکەوتن ‹شەوقی کە نەبێ باسیرە، مەئیووسە لە دیتن/ هەر شەوقی ئەوە قووەتی دینی بە نەزەر دا «نالی»› ☰ ١. زاییدن ٢. دیدن

**دین**[٢]: ناو. ئایین؛ کۆمەڵە ئامۆژەیێ کە لە لایەن پێغەمبەرێکەوە ڕانراوە و بە دەستی بڕێ لە شوێنکەوتوانی کۆ کراونەتەوە ☰ دین؛ آیین

**دین**[٣]: ئاوەڵناو. شێت؛ دێوانە؛ لێوە ☰ دیوانه

**دینا** / dîna/: ناو. فتوا؛ حوکمی شەرع بە بۆچوونی مەلایەک ☰ فتوا

**دینامیک**[١] / dînamîk/: ناو. لقێک لە زانستی میکانیک کە لە بارەی چۆنیەتی بزاڤی دەزگایەک لە ژێر کارتێکەری هێزدا، بەتایبەت ئەو هێزانەی کە لە دەرەوەی دەزگاکەدان، دەکۆڵێتەوە ☰ دینامیک

**دینامیک**[٢]: ئاوەڵناو. ١. بزۆز؛ لەجووڵە ٢. *[مەجاز]* چالاک؛ کۆشا ☰ ١و٢. دینامیک

**دیناو** / dînaw/: ناو. ئەوەی بە بیرکردنەوە و تێڕامان دەردەکەوێ ☰ مُکاشفه

**دیناوەر** / dînawer/: ناو. فتوادەر ☰ مُفتی

**دینتەنک** / dîntenik/: ئاوەڵناو. کەم‌باوەڕ؛ کەم‌بڕوا بەدین ☰ کم باور به دین

**دینج** / dînc/: ئاوەڵناو. ١. ئاسوودە و بێخەم ٢. مەند؛ مەن؛ خەڵوەت ☰ ١. آسوده ٢. خلوت؛ دنج

**دیندار**[١] / dîndar/: ناو. دارێکی لێڕەوارە ☰ از درختان جنگلی

**دیندار**[٢]: ئاوەڵناو. بەدین؛ خاوەن بڕوا بە ئایین ☰ دیندار

**دینداری** / dîndarî/: ناو. کاری بەجێ هێنانی داب و دەستووری ئایینیی بە باشی ☰ دینداری

**دیندڕ** / dîndiř/: ☜ **دینسز**

**دین‌دوژمن** / dîndujmin/: ئاوەڵناو. بێ‌ئۆل؛ بێ‌دین ☗ دین‌ستیز

**دینسز** / dînsiz/: ئاوەڵناو. دیندڕ؛ بێ‌بڕوا بە خوا ☗ بی‌دین

**دینگ** / dîng/: ناو. ١. دنگ؛ ئامرازی چەڵتووک پاک کردن ٢. دەساوان؛ دەسکاونگ ☗ ١. دنگ شالیکوبی ٢. دسته‌ی هاون

**دینگچی** / dingçî/: ناو. برنجکوت؛ کەسێ چەڵتووک ئەکوتێ ☗ دنگ‌کوب

**دینگه** / dînge/: ناو. ١. ☜ **دنگە ـ١** ٢. شێتخانە ☗ ١. ☜ **دەنگه** ٢. تیمارستان

**دینگی** / dingî/: ناو. پارە؛ پووڵ؛ دراو ☗ پول

**دین‌لایی** / dînlayî/: ناو. سیکولاریسم؛ سیستەمی لادینی ☗ سکولاریسم

**دینۆک**[١] / dînok/: ئاوەڵناو. شێتۆکە ☗ ساده‌لوح

**دینۆک**[٢]: ئاوەڵکار. کەمێک؛ تۆزکاڵێک ☗ اندکی

**دینەمۆ** / dînemo/: ناو. ١. ژێنراتۆر ٢. ترومپا؛ ناسووس ☗ ١. ژنراتور ٢. تُلمبه

**دینەوە** / dînewe/: چاوگ. ١. وەدیتن؛ دیتنەوە؛ دۆزینەوە ٢. چاو پێ‌کەوتنەوە؛ دووبارە دیتنی کەسێک ☗ ١. بازیافتن ٢. بازدیدن

**دینەوەر** / dînewer/: ناو. ١. دیناوەر؛ فتوادەر ٢. پردی سیرات ☗ ١. مُفتی ٢. پُل صراط

**دینی**[١] / dînî/: ناو. شێتی؛ شێتایەتی ☗ دیوانگی

**دینی**[٢]: ئاوەڵناو. ئایینی؛ سەر بە دین ☗ دینی

**دینیا** / dînya/: ☜ **دونیکه**

**دیو**[١] / dîw/: ناو. ١. مەڵبەند؛ ناوچە ‹دیوی پژدەر؛ دیوی گەورکان› ٢. ئوتاق؛ چاوەخانوو ‹ماڵەکەم سێ دیوی هەیە› ٣. دیو؛ لا؛ لاکانی هەر شت ‹من لەو دیوی پردەکەوە بووم؛ لەو دیوی پەردەکەوە ئێرە دیار نییە› ☗ ١. منطقه ٢. اتاق ٣. طرف؛ جهت

▪ **دیو**[٢]: پاشەوشە. بین ‹هیچ‌نەدیو› ☗ ـ دیده

**دیواچه** / dîwaçe/: ☜ **دیباچه**

**دیواخ** / dîwax/: ناو. تارا؛ خێلی ☗ روسری توری عروس

**دیواخان** / dîwaxan/: ☜ **دیوەخان**

**دیواخانه** / dîwaxane/: ☜ **دیوەخان**

**دیوار** / dîwar/: ناو. ١. دفێر؛ دیفەر؛ هەڵچنراوی بڵند لە ئاجور یان هەر شتێکی‌تر ‹دیوار ڕما، تۆزی هەڵسا «مەسەل»› ٢. *[کنایە]* لەمپەر؛ پەرژین؛ پەرچین؛ بەرهەڵست ☗ ١و٢. دیوار

▣ **بە دیواری ڕاستا هەڵگەڕان**: *[کنایە]* بە دەس و پاوە نەوێسان؛ لە کونی تفەنگی شەیتان دەرپەڕین؛ یەکجار بزۆز بوون ☗ از دیوار راست بالا رفتن

**لەگەڵ دیوار قسە کردن**: *[کنایە]* لەگەڵ دار و بەرد قسە کردن؛ گوێ‌بیس نەبوون ☗ با دیوار حرف زدن

**دیواربڕ** / dîwarbiř/: ناو. ئامرازی دیوار کون کردن بە دەست دزەوە ☗ ابزار سوراخ کردن دیوار برای دزدی

**دیوارپۆش** / dîwarpoş/: ناو. هەرکام لەو بەرهەمانەی (وەکوو کاغەزدیواری، پارچە و...) بۆ داپۆشینی ڕووکاری دیوار یان میچ بە کار دێت ☗ دیوارپوش

**دیوارچنی** / dîwarç(i)nî/: ناو. کاری چنینی ئاجور، بەرد یان بلووک بۆ دروست‌کردنی دیوار ☗ دیوارچینی

**دیواره** / dîware/: ناو. دیوارئاسا؛ لێواری بڵندکراو وەک دیوار ☗ دیواره

**دیوارێن** / dîwarên/: ناو. یارییەکی منداڵانە بە دەرزیلە دەیکەن (دوو کەس یەکێ دەرزیلەیەک دەهاون، ئەگەر دەرزیلەی کەسی دووهەم بستێک لە دەرزیلەی یەکەم نزیک بوو، دەرزیلەکەی هەڵدەگرێ بۆ خۆی) ☗ از بازی‌های کودکانه

**دیوان** / dîwan/: ناو. ١. ☜ **دیواخان** ٢. دەزگای

میری ٣. کتێبی شیعر ‹دیوانی نالی› 🇮🇷 ١. ☜ دیواخان ٢. دستگاه دولتی ٣. دیوان شعر

**دیوان‌خانه** / dîwanxane/: ☜ **دیوه‌خان**

**دیواندڕ** / dîwandiř/: ئاوه‌ڵناو. *[مه‌جاز]* ده‌مڕاست؛ قسه‌زان 🇮🇷 سخنور

**دیواندەر** / dîwander/: ئاوه‌ڵناو. دیواندەر؛ دیواودەر؛ دیواودیو؛ دیوەدەر؛ دیواندەر؛ کونبوو له‌ هه‌ر دوو دیو 🇮🇷 از دو طرف سوراخ

**دیواندیو** / dîwandîw/: ئاوه‌ڵکار. دیواندیو؛ به‌راوه‌ژوو؛ پێچه‌وانه ‹که‌واکه‌ی دیواندیو ده‌به‌ر کردووه› 🇮🇷 وارونه؛ پشت و رو

**دیوانی**[1] / dîwanî/: ناو. جۆرێ خه‌تی نووسین 🇮🇷 نوعی خط

**دیوانی**[2]: ئاوه‌ڵناو. ده‌وڵه‌تی؛ سه‌ر به‌ ده‌وڵه‌ت 🇮🇷 دیوانی

**دیواودەر** / dîwawder/: ☜ **دیواندەر**

**دیواودیو** / dîwawdîw/: ئاوه‌ڵناو. ١. ☜ **دیواندەر** ٢. دیواندیو 🇮🇷 ١. ☜ **دیواندەر** ٢. وارونه؛ پشت و رو

**دیوناس** / dîwnas/: ئاوه‌ڵناو. ئاشنا 🇮🇷 آشنا

**دیوه‌خان** / dîwexan/: ناو. دیواخان؛ دیواخانه؛ دیوان‌خانه؛ دیوان؛ دیوان: ١. ژووری کۆمه‌ڵ لێ دانیشتن ‹ئێواران که‌ ده‌هاته‌وه‌ دیوه‌خان، له‌ لای سه‌روو ڕۆده‌نیشت، تا شه‌و شه‌ق ده‌بوو -وه‌ک هه‌یکه‌لی بوودا- مته‌قی لێ ده‌ر نه‌ده‌هات «هه‌ژار، چێشتی مجێور»› ٢. ئۆده‌ی میوانی 🇮🇷 ١. مجلس عمومی ٢. اتاق مهمانی

**دیوه‌دەر** / dîweder/: ☜ **دیواندەر**

**دیۆد** / d(i)yod/: ناو. لامپی ئیلیکترۆنی بۆ یه‌کلایی کردنه‌وه‌ی ڕه‌وتی کاره‌با 🇮🇷 دیود

**دیه**[1] / d(i)ye/: ناو. ١. دیده؛ چاو ‹دیه‌ ڕاسه‌که‌م!› ٢. خوێنبایی؛ تاوان؛ پاره‌ یان ماڵێک که‌ تاوانکار ده‌بێ به‌ که‌سی به‌رکه‌وتوو یان بنه‌ماڵه‌که‌ی بدات 🇮🇷 ١. چشم ٢. دیه

**ـ دیه**[2]: پاشه‌وشه. دیتوو ‹کاردیه› 🇮🇷 ـ دیده

**دیه‌نی** / d(i)yenî/: ناو. ملاقات؛ مولاقات؛ دیدار؛ دیمانه ‹چووه‌ کرماشان بۆ دیه‌نی فه‌رهاد/ دیته‌ چێ کریه‌ فه‌رهاد ڕه‌نجبه‌باد؟! «فولکلۆر»› 🇮🇷 مُلاقات

**دیه‌ی** / d(i)yey/: چاوگ. دیتن؛ چاو پێ که‌وتن ‹دیش له‌یلێ وه‌ ناز چوار زانوو نیشته‌ن/ جه‌ قه‌ده‌م تا فه‌رق نوور پێدا وه‌شته‌ن «خانای قوبادی»› 🇮🇷 دیدن

**دیهاری** / dîharî/: ناو. سه‌وقات؛ سلامانه؛ دیاری؛ ده‌سایز 🇮🇷 ارمغان

**دێ**[1] / dê/: ناو. ١. ئاوایی؛ گوند؛ لادێ ٢. دایک؛ دالک ٣. سۆمای چاو ٤. ☜ **ده‌یر** ٥. دێو؛ دێڤ؛ شتێکی خه‌یاڵی و ترسێنه‌ر ٦. ڕه‌وتی ڕامان و ورد بوونه‌وه‌ ٧. دال؛ ناوی پیتی ده‌یه‌می ئه‌لفبای زمانی کوردی 🇮🇷 ١. ده؛ روستا ٢. مادر ٣. بینایی ٤. ☜ **ده‌یر** ٥. دیو ٦. تأمل و دقت ٧. دال؛ نام حرف دهم الفبای زبان کردی

▣ **دێ نه‌گه‌یی دوکه‌ڵ گه‌یی:** *[کینایه]* سه‌رهه‌ڵدانی شتێکی ناوه‌خت و نابه‌جێ 🇮🇷 اشاره به‌ نابهنگام آمدن چیزی

**دێ کرن:** لێ ورد بوونه‌وه‌ 🇮🇷 دقت کردن

**دێ**[2]: ئاوه‌ڵکار. ده‌بێ؛ ئه‌شێ ‹دێ هه‌ڕم؛ دێ وه‌ بیتن› 🇮🇷 باید

**دێ**[3]: ده‌نگ. ده‌ی؛ هه‌ا؛ وشه‌ی لێخوڕینی که‌ڵ و گامێش 🇮🇷 کلمه‌ی راندن گاومیش

**دێباڤ** / dêbav/: ناو. دایکی باوک؛ نه‌نک له‌ باوکه‌وه‌ 🇮🇷 مادرِ پدر

**دێبکه** / dêbke/: ☜ **ده‌مکه**

**دێبه‌ر** / dêber/: ناو. به‌ر دێ؛ زه‌ویینی خوارووی ئاوایی ‹بالا چون چنار هه‌ڵچوو له‌ دێبه‌ر/ بۆ خۆم کاروانی ئاشقه‌ سێبه‌ر «فولکلۆر»› 🇮🇷 زمین پایین آبادی

**دێبه‌گی** / dêbegî/: ناو. گوندی ئاغه‌واتی؛ گوندێک به‌ یه‌ک یا چه‌ند ئاغاوه‌ 🇮🇷 دهِ اربابی

**دێجومه** / dêcume/: ☜ **دێوجامه**

**دێخوون / dêxûn/:** ☜ **دۆخین**

**دێد / dêd/:** ناو. ١. دیدە؛ دیدێ؛ نازناو بۆ خوشکی گەورە ٢. پلک؛ میمک؛ خوشکی باوک ☰ ١. خواهر بزرگ ٢. عمّه

**دێدار / dêdar/:** ناو. ١. خاوەنی ئاوایی؛ خێوی گوند ٢. دێیار؛ بەرپرسی کاروباری سەر بە دەوڵەتی دێ ☰ ١. مالک ده ٢. دهیار

**دێداری / dêdarî/:** ناو. بنکەی دەوڵەتی ڕاگەیشتن بە کار و باری دێ ☰ دهیاری

**دێدک / dêdik/:** ☜ **دێدەڕەش**

**دێدە / dêde/:** ☜ **دێد ١**

**دێدەڕەش / dêdeřeş/:** ناو. دێدک؛ سپڵ ☰ طحال؛ سپُرز

**دێدەک / dêdek/:** ☜ **دیلەکانێ**

**دێدەکانێ / dêdekanê/:** ☜ **دیلەکانێ**

**دێدی / dêdî/:** ناو. دێدیک؛ بێشکە؛ لانک؛ لانکە ☰ گهواره

**دێدیک / dêdik/:** ☜ **دێدی**

**دێدێ / dêdê/:** ☜ **دێد ١**

**دێ.دێ.تێ / dê.dê.tê/:** ناو. دەوای مێرووکوژ ☰ د.د.ت

**دێر[1] / dêr/:** ناو. دەیر؛ جێگەی ڕەبەنی خاچپەرستان ☰ دَیر راهبان

**دێر[2]:** ئاوەڵناو. ١. دێرس؛ درەنگ ٢. کۆنە؛ کۆن ☰ ١. دیر ٢. قدیمی

⊡ **دێر بون:** کات ڕابردن ☰ دیر شدن

**دێر[3]:** ئاوەڵکار. بە دوای کاتی خۆ ‹دێر هەڵدەستێ› ☰ دیر

⊡ **خستنە دێر:** وە درەنگ خستن ☰ عقب انداختن

**کەوتنە دێر:** وە درەنگ کەوتن ☰ عقب افتادن

**دێر-[4]:** پێشوشە. دوای کاتی ئاسایی ‹دێراخێز› ☰ دیر-

**- دێر[5]:** پاشەوشە. ١. بدێر ‹ئاودێر› ٢. ـ هەڵگر؛ دە خۆ گر ‹فرەدێر› ٣. بگێڕ ‹چاوەدێر› ☰ ١. ـ یار ٢. ـ گیر ٣. ـ یار

**دێراخێز / dêraxêz/:** ئاوەڵناو. دێرخێز؛ تەوەزەل؛ تەمەڵ؛ لەشگران ☰ تنبل

**دێران[1] / dêran/:** چاوگ. تێپەڕ. تێنەپەڕ. //دێرای؛ دەدێرێی؛ بدێرێ// ◻ تێپەڕ. داریای: ١. ئاو داشتن؛ دێرین؛ ئاویاری کردن ◻ تێنەپەڕ. ٢. دێریان؛ ئاودێری کران ‹ئەمن لە خاکی کوردی ڕواوم/ بە ئاوی ساردی کانی دێراوم «هێمن»› ٣. گونجان؛ جێگا تێدا بوونەوە ‹ئەم دەفرە هەموو ئەو شیرە نادێرێ› ☰ ١. آبیاری کردن ٢. آبیاری شدن ٣. گنجایش داشتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: دێراو/ چاوگی نەرێنی: نەدێران

**دێران[2]:** ئاوەڵناو. ١. لێقەوماو؛ کۆستکەوتە ٢. وێران ☰ ١. درمانده ٢. ویران

**دێراندن / dêrandin/:** چاوگ. ١. دێرانن ٢. دەڵاندن ☰ ١. آبیاری کردن ٢. نشت دادن

**دێرانن / dêranin/:** چاوگ. داشتنی زەوی؛ ئاودێری کردن ☰ آبیاری کردن

**دێراو[1] / dêraw/:** ناو. ١. بۆ؛ زەمینی چاڵکراو بۆ ئاوی ئاودێری تێدا مان ٢. کەرد؛ کردوو؛ کەردوو ‹باسی داربڕین یا جۆگە و جۆماڵ/ دێراوی تووتن شێف و وەردی کاڵ «قانع»› ☰ ١. جوب؛ جوی ٢. کرت

⊡ **دێراو هەڵدان:** دروست کردنی دێراو بە کەردووکێش بۆ شووتی، خەیار، تەماتە و ... ☰ ساختن جوی صیفی‌جات

**دێراو[2]:** ئاوەڵناو. دێریاگ: ١. ئاویاری کراو ٢. بە مەودای زۆرەوە ئاودراو ☰ ١. آبیاری شده ٢. دیربه‌دیر آبیاری شده

**دێراودێر / dêrawdêr/:** ☜ **دێر ـ دێر**

**دێراوەڕەز / dêraweřez/:** ناو. قانەمێو؛ قانە ☰ چوب تاکستان

**دێرباوەر / dêrbawer/:** ئاوەڵناو. باوەڕگران؛ سەختباوەڕ ☰ دیرباور

**دێرتاو / dêrtaw/**: ئاوەڵناو. ١. بە تایبەتمەندی توانەوەی درەنگ لە دەمای زۆر ژووردا ٢. قورس؛ سەنگین؛ دێرهەرس؛ دێرهەزم ☰ ١. دیرگداز ٢. دیرهضم

**دێرخێز / dêrxêz/**: ☜ **دێراخێز**

**دێردراو / dêrd(i)raw/**: ئاوەڵناو. دەون؛ ئاوداشتە ☰ آبیاری‌شده

**دێر ـ دێر / dêr dêr/**: ئاوەڵکار. دێراودێر؛ دێربەدێر؛ درەنگ ـ درەنگ؛ بە ماوەگەلی زۆرەوە ‹دێر ـ دێر دەیبینم› ☰ دیر به دیر

**دێرڕەس / dêřes/**: ئاوەڵناو. دێریاو؛ ئاقزەمکی؛ بێ‌خێرایی پێویست لە گەیشتن یا پێگەیشتندا. بەرانبەر: **زووڕەس** ☰ دیررس

**دێرزەمان / dêrzeman/**: ئاوەڵناو. زووگین؛ پێشوونە ☰ دیرینه

**دێرس[1] / dêris/**: ناو. دێرهات؛ درەنگ؛ دواکەوت ☰ درنگ؛ تأخیر

**دێرس[2]**: ئاوەڵناو. ١. کاول؛ وێران؛ دێران ٢. کۆن؛ کەونارا ☰ ١. ویران ٢. قدیمی

**دێرسی[1] / dêrisî/**: ناو. ١. درەنگی؛ دێری ٢. وێرانی؛ کاولی ☰ ١. دیری ٢. ویرانی

**دێرسی[2]**: ئاوەڵناو. لەمێژینە ☰ باستانی

**دێرک / dêrik/**: ناو. جێ ژیانی بچکۆلەی پیاوی ڕەبەن ☰ صومعەی راهب

**دێرکوڵ / dêrkuł/**: ئاوەڵناو. بە تایبەتمەندی درەنگ هاتنە کوڵ ‹ئەم گۆشتە یەکجار دێرکوڵە›. هەروەها: **دێرکوڵی** ☰ دیرپز

**دێرکی / dêrkî/**: ☜ **دێرەکی**

**دێرگا / dêrga/**: ناو. درەنگان؛ دێروەخت؛ ماوەی دوای کاتی دیاریکراو ☰ دیرهنگام

**دێرندێز / dêrindêz/**: ☜ **دیلندێز**

**دێروەخت / dêrwext/**: ناو. دێرگا؛ درەنگان؛ ماوەی دوای کاتی دیاریکراو ☰ دیرهنگام

**دێرۆ / dêro/**: ناو. گیایەکە وەک مۆسک وایە، گوڵی زەردە ☰ از گُل‌ها

**دێرۆخە / dêroxe/**: ناو. دێرۆغە؛ دێرەدۆخ؛ دێرەدۆغ؛ چەشنێ ئاودێری لە کەم‌ئاویدا کە دێراو پڕ دەکەن و بۆ سەر دێراوی‌تری دەشکێنن ☰ روشی برای آبیاری در مواقع کم‌آبی

**دێرۆغە / dêroğe/**: ☜ **دێرۆخە**

**دێرۆک / dêrok/**: ☜ **دێرۆك**

**دێرە / dêre/**: ناو. فیستان؛ کراسی ژنانەی باکووری کوردستان کە لە پارچەی ڕەنگاوڕەنگ دەیدوورن ☰ نوعی پیراهن زنانه در شمال کردستان

**دێرەدار / dêredar/**: ئاوەڵناو. چاوەڕوان؛ چاوڕوان؛ چاونۆڕ ☰ چشم‌به‌راه

**دێرەدۆخ / dêredox/**: ☜ **دێرۆخە**

**دێرەدۆغ / dêredoğ/**: ☜ **دێرۆخە**

**دێرەکی / dêrekî/**: ناو. دێرکی؛ جۆرێ هەنجیر ☰ نوعی انجیر

**دێرەوان / dêrewan/**: ناو. زێرەڤان؛ پاسەوان. هەروەها: **دێرەوانی** ☰ نگهبان

**دێرهات / dêrhat/**: ☜ **دێرس[1]**

**دێرهەرس / dêrhers/**: ئاوەڵناو. دێرهەزم؛ قورس؛ سەنگین؛ دێرتاو؛ بە تایبەتمەندی درەنگ هەڵتاوان لە گەدەدا ☰ دیرهضم

**دێرهەزم / dêrhezm/**: ☜ **دێرهەرس**

**دێرهەم / dêrhem/**: ناو. دیرهەم؛ درەم: ١. یەکەی پارەی زۆرێک لە وڵاتانی ئیسلامی لە ڕابردوودا ٢. یەکەی پارەی میرنشینی عەرەبی و مەراکێش ☰ ١و٢. درهم

**دێری / dêrî/**: ناو. درەنگی ☰ دیری

**دێریاگ / dêryag/**: ☜ **دێراو[2]**

**دێریان / dêryan/**: ☜ **دێران**

**دێریاو / dêryaw/**: ☜ **دێرڕەس**

**دێریک[1] / dêrîk/**: ناو. مێژوو؛ تاریخ ☰ تاریخ

**دێریک**[٢]: ئاوەڵناو. زۆر کەونارا؛ لەمێژینە 🖙 باستانی

**دێرین**[١] / dêrîn/: ☜ **دێران ـ١**

**دێرین**[٢]: ☜ **دێرینە**

**دێرینە** / dêrîne/: ئاوەڵناو. دێرین؛ کۆن ‹ئەی هومێد! ئەی ڕەفیقی دێرینەم!/ تۆ نەبی کێم هەیە منی بێکەس؟ «هێمن»› 🖙 دیرینە

**دێرینەناس** / dêrînenas/: ناو. کۆنینەناس 🖙 دیرینەشناس

**دێرێ** / dêrê/: ئاوەڵکار. دێرێک؛ ماوەیەکی زۆر ‹دێرێ هاتەو لە شار› 🖙 دیروقت؛ دیری

**دێرێک** / dêrêk/: ☜ **دێرێ**

**دێڕ** / dêř/: ناو. ڕیز؛ خەت؛ ڕزنێکی ئاسۆیی لە نووسراوە 🖙 سطر

**دێز**[١] / dêz/: ناو. دێزە: ١. ڕەنگی ڕەش ٢. ڕەنگی ڕەشی ئاماڵ بۆر ٣. دیزەی شێو تێدا لێنان ٤. گیشەی گەڵا و گیا بۆ زستان 🖙 ١. سیاه ٢. رنگ خاکستری تیره ٣. دیزی ۴. تودەی برگ برای علوفەی زمستانی

**دێز**[٢]: ئاوەڵناو. دێزە: ١. *[کینایە]* جووتقۆشە؛ شووم؛ بێفەڕ ٢. بۆنەهاتگ؛ بەدبەخت ٣. خاوەن ڕەنگی ڕەش ‹خاڵ چ خاڵ مەر لەعل بەدەخشان دێز/ لەعل ئەحمەربێز مەرجان یاقووت ڕێز «خانای قوبادی»› 🖙 ١. شوم ٢. بدشانس ٣. بە رنگ خاکستری تیرە

**دێزا** / dêza/: ناو. زڕکچ کە دەگەڵ دایکی چووبێتە ماڵی زڕباوکی 🖙 دختری کە با مادرش ساکن خانەی ناپدری است

**دێزپا** / dêzpa/: ناو. دێسپا؛ سێکوچکە؛ سێ بەردەی کوچکاور 🖙 اُجاق سنگی

**دێزک** / dêzik/: ناو. دێز؛ دێزگ؛ ڕەشی ئاماڵ بۆر 🖙 خاکستری تیرە

**دێزگ**[١] / dêzig/: ☜ **دێزك**

**دێزگ**[٢]: ئاوەڵناو. دێزک: ١. ڕۆژڕەش؛ بەدبەخت ٢. بە ڕەنگی ڕەشی ئاماڵبۆر ‹کەر دێزگ› 🖙 ١. بدبخت ٢. خاکستری تیرە

**دێزە** / dêze/: ☜ **دێز**

**دێزەبەدەرخۆنە** / dêzebederxone/: ☜ دیزەبەدەرخۆنە

**دێزەک** / dêzek/: ئاوەڵناو. دێزەگ: ١. تەمەڵ؛ بێکارە ٢. غایەن؛ بێبەخت 🖙 ١. تنبل ٢. بدشانس

**دێزەگ** / dêzeg/: ☜ **دێزەك**

**دێزەڵ** / dêzeł/: ☜ **دێزیل**

**دێزیل** / dêzîl/: ناو. دێزەڵ؛ گیایەکی نێو بێستانە، گوڵی سپی دەردەکا و گەڵاکەی پەنجەییە 🖙 گیاهی است

**دێژداشە** / dêjdaşe/: ناو. عەزیزی؛ کراسی ئاودامێن بۆ شەوانە 🖙 پیراهن بلند شبخواب

**دێژنک** / dêjink/: ناو. تەڕەتیزە؛ تەڕەتوولە؛ تەڕەتووره؛ تووزەک؛ ڕەشادۆک؛ گیایەکی یەک ساڵەیە گەڵاکەی دەخورێ، گوڵی سپی و سوورکاڵ و بۆنخۆشی هەیە 🖙 شاهی

**دێسپا** / dêspa/: ☜ **دێزپا**

**دێسنی** / dêsnî/: ☜ **داسنی**[٢]

**دێڤ** / dêv/: ☜ **دێو ـ١**

**دێڤانە** / dêvane/: ☜ **دێوانە**[٢]

**دێڤونە** / dêvune/: ☜ **دێوانە**[٢]

**دێق** / dêq/: ☜ **دیق**

**دێقە** / dêqe/: خولەک؛ دەقیقە؛ هووردەم 🖙 دقیقە

**دێکانە** / dêkane/: ☜ **دەموکانە**

**دێکانی** / dêkanî/: ☜ **دێهاتی**

**دێکەر** / dêker/: ناو. بێگانە؛ بیانی؛ نامۆ 🖙 بیگانە

**دێکەڵ** / dêkeł/: ☜ **دەکەڵ**

**دێگە** / dêge/: ناو. ١. شوێنی دێ؛ ئاسەواری دێ؛ جێگوند ٢. خالتیک؛ خوشکی دایک 🖙 ١. جای و اثر دهکده ٢. خالە

**دێگەڵ** / dêgeł/: ☜ **دەکەڵ**

**دێگەڵە** / dêgełe/: ☜ **دەکەڵ**

**دێل / dêl/**: ☜ **دێڵ**

**دێلاڤ / dêlav/**: ناو. ڕێژگەی ئاوی ڕووبار ☰ جایی که آب رودخانه در آن می‌ریزد

**دێلم / dêlim/**: ناو. قاش؛ کووز ☰ قاچ

**دێلەڤ / dêlev/**: ناو. جێگا ☰ جا

**دێلەکانێ / dêlekanê/**: ☜ **دیلەکانێ**

**دێلەمار / dêlemar/**: ناو. ماری ژەهردار ☰ مار سمی

**دێلێ / dêlê/**: ☜ **دێڵە**[1]

**دێڵ / dêł/**: ناوەڵناو. دێڵ؛ دێڵە: ١. مێوینەی جانەوەران ٢. دیل؛ یەخسیر؛ گیراو لە شەڕدا ☰ ١. ماده (حیوان) ٢. اسیر

**دێڵە[1] / dêłe/**: ناو. دێلێ؛ تەختە بەردی سەربانپۆش ☰ پوشەی سنگی سقف

**دێڵە[2]**: ☜ **دێڵ**

**دێڵەبەبا / dêłebeba/**: ☜ **دەڵەبەبا**

**دێڵەبەن[1] / dêłeben/**: ناو. ١. میچی خانووی بە بەرد داپۆشراو ٢. وەستای دێڵەبەنی ☰ ١. سقف پوشیده با تخته‌سنگ ٢. بنّای سنگ‌پوش سقف

**دێڵەبەن[2]**: ناوەڵناو. بەردەڕێژ؛ بە تۆژێ لە بەرد داپۆشراو ‹شەقامی دێلەبەن› ☰ سنگفرش

**دێڵەدڕ / dêłedir̄/**: ناوەڵناو. *[پلار]* بێحەیا؛ زماندرێژی بێشەرم (ژن) ☰ سلیطه

**دێڵەدێو / dêłedêw/**: ناو. نەڕنایش ☰ دله‌دیو

**دێڵەسەگ / dêłeseg/**: ☜ **دەڵەسەگ**

**دێڵەکەر / dêłeker/**: ناو. ماهەر؛ ماکەر؛ ماکەر ☰ ماده‌الاغ

**دێم / dêm/**: ☜ **دەیم**

**دێماری / dêmarî/**: ناو. زڕدایک؛ باوەژن ☰ نامادری

**دێمجامە / dêmcame/**: ناو. ١. ☜ **دێوجامە** ٢. تاپۆ؛ شتی خەیاڵی کە دێتە بەر چاو ☰ ١. ☜ **دێوجامە** ٢. شَبَح

**دێمچێن / dêmçên/**: ناو. دەیمکێڵ؛ دێمەکارکێڵ ☰ کشاورز دیم‌کار

**دێمزار / dêmzar/**: ناو. دێمەڕۆک؛ دێمەکار؛ زەوینی دێم ☰ زمین دیم

**دێمکە / dêmke/**: ☜ **دەمکە**

**دێمەرە / dêmere/**: ناو. چۆلەکە؛ مەلیچک ☰ گُنجشک

**دێمەڕۆک / dêmeřok/**: ☜ **دێمزار**

**دێمەکار / dêmekar/**: ☜ **دێمزار**

**دێمەکارکێڵ / dêmekarkêł/**: ناو. دێمچێن ☰ کشاورز دیم‌کار

**دێمەکاری / dêmekarî/**: ☜ **دەیم[1]ـ١**

**دێمی / dêmî/**: ☜ **دەیمی**

**دێمیلە / dêmîle/**: ناو. ١. زوڕات؛ هەرزنە گەورە ‹دێمیلە بێتە نانم، ئەبێتە بەڵای گیانم «مەسەل»› ٢. ترۆزی دێمی ☰ ١. ذرت ٢. خیارچنبر دیمی

**دێن[1] / dên/**: ناوەڵناو. پێخواس؛ پاپەتی ☰ پابرهنه

▪ **دێن[2]**: پاشەوشە. جێ؛ جێگە ‹ناندێن› ☰ ـ دان؛ ـ دانی

**دێنشین / dên(i)şîn/**: ناوەڵناو. دێهاتی؛ لادێیی؛ گوندی ☰ روستایی

**دێنێ / dênê/**: ☜ **دوێکە**

**دێو / dêw/**: ناو. ١. موەکل؛ بوونەوەرێکی خەیاڵی لە شێوەی مرۆیەکی زۆر ناشیرین و ناحەز و زەبەلاح، زۆرتر بە شاخ و کلک و چنگی درێژەوە ٢. *[مەجاز]* کەسی ناخار؛ ناقۆلا؛ زەبەلاح؛ زلحۆرت؛ تەژە؛ ناقۆلا و بەوتەشک ٣. *[مەجازی، کۆن]* ئەهریمەن؛ شەیتان؛ هووت ٤. ☜ **دەیر** ٥. لا؛ بەر؛ ئالی؛ تەرەف ‹لە کام دێوی پردەکەی هەڵواسم؟› ٦. دیو؛ ژوور ‹شەکەتی، بچۆ ئەو دێو بخەفە!› ☰ ١تا٣. دیو ٤. ☜ **دەیر** ٥. طرف؛ جهت ٦. اتاق

**دێوا / dêwa/**: ناو. جۆرە پارچەیەکی ئاوریشمە ☰ دیبا

**دێوار / dêwar/**: ناو. بێگانە؛ بیانی ☰ بیگانه

**دێوان** / dêwan/: ناو. ١. ☜ **دیواخان** ٢. کوێخا؛ ئاگاداری گوند ☰ ١. ☜ **دیواخان** ٢. کدخُدا

**دێواندەر** / dêwander/: ☜ **دیواندەر**

**دێواندێو** / dêwandêw/: ☜ **دیواندیو**

**دێوانە**[1] / dêwane/: ناو. ١. دەروێشی حا و حووکەر ٢. *[مەجاز]* تاکە- تاکەی دەغڵ کە تازە سەر وە دەر دەنێ ☰ ١. درویش مجذوب ٢. کِشتی کە تک و توک سبز شده باشد

**دێوانە**[2]: ئاوەڵناو. ١. دێڤانە؛ دێڤونە؛ گێل و حۆل و نەفام ٢. دین؛ لێوە؛ شێت ٣. بە ئاکاری نائاساییەوە ‹کچە دێوانە کوڕی بەو باشییەی جواب دا› ٤. تووش بووی تووڕەیی و دڵەڕەپێ زۆر ‹خەریک بوو دێوانە دەبووم› ٥. *[مەجاز]* تووشیاری تاسەی زۆر ‹دێوانەی ژنەکەی بوو› ☰ ١. گیج و منگ ٢. مجنون ٣تا٥ دیوانە

**دێوانە**[3]: ئاوەڵکار. وەک دێو ‹دێوانە ئەیگوڕاند› ☰ دیوسان

**دێوانەیی** / dêwaneyî/: ناو. شێتی؛ لێوەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی دێوانە بوون ☰ دیوانگی

**دێوبەند** / dêwbend/: ناو. نووشتە بۆ شێت چا کردنەوە ☰ دعایی کە برای دیوانە می‌نویسند

**دێوجامە** / dêwcame/: ناو. دیجامە؛ دێجومە؛ دێمجامە؛ چەند پارچە پەڕۆی ڕەنگاوڕەنگە لێکی دەدەن و لە ڕاوەکەودا دەکاری دێنن ☰ دیوجامە

**دێودڵ** / dêwdił/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ئازا؛ نەترس ☰ پُردل؛ شُجاع

**دێور** / dêwir/: ناو. زڤڕ؛ کار و ڕەوتی گەڕانەوە ☰ برگشت

**دێوڵ** / dêwił/: ناو. زەنگۆڵە؛ زەنگوڵە ☰ زنگولە

**دێوڵکە** / dêwiłke/: ئاوەڵناو. گێژەڵووکە ☰ گردباد

**دێونای** / dêwnay/: ☜ **وروژاندن**

**دێو و درنج** / dêw û d(i)rinc/: ناو. شتگەلی خەیاڵی وەکوو جنۆکە و مێردەزمە ☰ موجودات خیالی

**دێوەرژەن** / dêwetjen/: ناو. دێوەرژەنگ؛ تۆز و دووکەڵی تێکەڵاوی خەست ☰ دود و غبار غلیظ

**دێوەرژەنگ** / dêwerjeng/: ☜ **دێوەرژەن**

**دێوەرە** / dêwere/: ناو. دیڤەرە؛ چەرچی ☰ پیلەور

**دێوەزمە** / dêwez(i)me/: ناو. *[باوەڕی کۆن]* جنۆکەیەکە شەوانە ترسەنۆک و ئازا دەئەزموێ ☰ دیوآزما

**دێوەشەلە** / dêweşele/: ناو. ئەستێرەی گەورەی حەوبرالە ☰ ستارەی هفت برادران

**دێوەڵ** / dêweł/: ناو. مزگان؛ پەرسگە؛ جێگەی لە خوا پاڕانەوە، بەتایبەت هی جگە لە موسوڵمانان ☰ معبد

**دێوەڵۆکە** / dêwełoke/: ناو. دێوڵکە؛ گێژەڵووکە ☰ گردباد

**دێوەڵووکە** / dêwełûke/: ناو. *[باوەڕی کۆن]* جنۆکەی کورتەباڵای هەموو گیان تیسکن ‹ئێستەش کراسی چڵکنە، ناولنگی کوڵکنە/ وەک دێوەڵووکە تووکی بەری بستێ هاتووە! «شێخ ڕەزا»› ☰ جن کوتاه قد پشمالو

**دێوی** / dêwî/: ئاوەڵناو. دێوانە؛ کاری وەک کاری دێو ☰ دیوسان

**دێویای** / dêwyay/: چاوگ. وروژان؛ هێرش هێنان ‹یانەم وێرانەن، دەردم دێویان/ چوون ئاهووی تەنیا، سەر لێم شێویان «خاڵۆی کۆماسی»› ☰ هجوم آوردن

**دێه**[1] / dêh/: ☜ **دەیر**

**دێه**[2]: دەنگ. دەی؛ وشەی دنە دان ☰ هی؛ کلمەی تحریک

**دێهات** / dêhat/: ناو. ئاوایی؛ دێ؛ گوند ☰ روستا

**دێهاتی** / dêhatî/: ئاوەڵناو. دێکانی؛ دیاتی؛ لاگەیی؛ نیشتەجێی دێ ☰ دهاتی؛ روستایی

**دێیار** / dêyar/: ناو. بەرپرسی کاروباری دەوڵەتی لە دێدا ☰ دهیار

# ڕ

# ٧

**تێبینی:** /ر/ ، /R,r/ نیشانەی پیتی یازدەهەمی ئەلفوبێی زمانی کوردی، ئەگەرچی نوێنەری واچ (فۆنیم)ێکی سەربەخۆیە، بەڵام ناکەوێتە سەرتای وشەوە؛ هەروەها دەوری نێوانگر و پاشگریش ناگرێتە خۆی. واتا ڕێ سەرەتایی وشە، هەمیشە دوازدەهەمین نیشانەیە، کە بەم شێوە دەنووسرێت: /ڕ/ ، /Ř,ř/ و ئەم دووە نابێ تێکەڵ بکرێن.

**ڕ /ř/:** پیت. نیشانەی پیتی دوازدەهەمی ئەلفبای زمانی کوردی ر؛ نشانەی حرف دوازدهم الفبای کُردی

**ڕ /ři/:** ناو. ناوی پیتی دوازدەهەمی ئەلفوبێی زمانی کوردی ر؛ حرف دوازدهم الفبای زبان کُردی

**ڕا[1] /řa/:** ناو. ١. بۆچوون؛ بیر و بۆچوون ‹ڕای تۆ چییە؟› ٢. دەنگ؛ بڕوای تاک یان کۆمەڵگا لە هەمبەر بابەتێک ‹بە ڕای خەلک چووە پارلەمان› ٣. ڕێگا؛ ڕێگە ‹نە ڕای پەسم بی، نە ڕاگەی پیشم/ نە ڕووی ماڵ خوەم نە قەوم و خویشم «شامی»› ٤. ڕەزامەندی ‹ئەو کچە ڕای لە سەر نییە› ٥. ڕەگ؛ ڕەی ٦. هەڕا؛ غار؛ بەز؛ دۆخی بە پەلە ڕۆیشتن ١. نظر ٢. رأی ٣. راه ۴. رضایت ۵. رگ ۶. دَو

◘ **ڕا بونەوە:** ئاخێزانەوە؛ ژیانەوەی دوای مەرگ برخاستن پس از مرگ

**ڕا دان:** هەڵساندن و بردن و لێخوڕینی ئاژەڵ و ماڵاتی مۆڵبەستوو راندن حیوانات برای چریدن

**ڕا کردن:** ١. غاردان؛ بەلەز چوون ‹هەروا سوورەو ڕا دەکا/ تۆز و خۆڵ بە با دەکا «هەژار، پێنج *ئەنگوست*»› ٢. هەڵاتن (لە ترسان و ...) ‹شا ڕای کرد؛ حکوومەتی تازە دامەزرا «هەژار، چێشتی مجێور»› ٣. ڕێ کردن؛ بە ڕێدا ڕۆیشتن ٤. تێڕۆ کردن؛ پێدا چەقاندن ١. دویدن ٢. فرار کردن ٣. راه رفتن ۴. فرو کردن

**ڕا کرن:** ١. بەرزەوە کردن ٢. هەڵاتن لە ترسان ٣. بە غار ڕۆیشتن ١. بلند کردن ٢. فرار کردن ٣. دویدن

**ڕای دان:** شاندان؛ نیشاندان نشان دادن

**ڕا[2]:** ناوەڵناو. ڕام؛ کەوی ‹پێت خۆشە خەڵکی لە ڕای تۆ ڕا بن؟› رام

**ڕا[3]:** ناوەڵکار. کەڕەت؛ جار؛ چەل ‹سەد ڕا؛ یەک ڕا؛ ڕایەکیان› بار؛ دفعه

**ڕا[4]:** ئامراز. ١. وە؛ دا؛ لەگەڵ پیتی «لە» یان «دە» گرۆی ئیزافی پێکدێنێ ‹لەو دەمەی ڕا دڵم لێی‌داوە بۆ ژوان/ من دیوانەی چاوی جوانم، چاوی جوان! «هێمن»› ٢. نەقش‌نوێنی هەندێک گرۆی

ئیزافییە ‹لە سنەڕا تا هەولێر› ٣. بۆ؛ ئەڕا ‹پەلم ڕاکێشن ڕای کوێرەکانی/ بۆ لای لەیل ئەچم شەو بە میوانی «فولکلۆر»› ≡ ١و٢. حرف اضافه ٣. سوی

**ڕا-**[5]: پێشگر. ١. لە سەرەتای ڕەگ یا ڕیشەی کارەوە دێ و گۆیا لە ڕاستەوە گۆڕاوە و مانای ڕاستەوڕاست (لە باری ئاسۆیی) لەگەڵە ‹ڕاخستن؛ ڕاکێشان› ٢. دێتە سەر ئاوەڵناو و ناو، ئاوەڵناوی دیکە دروست دەکات ‹ڕاژۆر؛ ڕاژێر؛ ڕایەڵ؛ ڕابەر› ٣. تێ؛ بۆ ناوەوە ‹ڕابوون؛ ڕاکردن؛ ڕاپۆڕاندن› ٤. ڕێ؛ ڕێگە ‹ڕاهێنان؛ ڕاهاتن› ≡ پسوند: ١. مصدر ساز ٢. صفت‌ساز ٣. در- ۴. راه -

**ڕائاو** / řa'aw/: ناو. ١. ئاوەڕێ؛ ڕێگەی سەفەر بە ئاوا ٢. ئاوەڕۆ؛ ڕەهەن؛ ئاقڕێژگە؛ ژێراوی ئاوی پیس ≡ ١. راه آبی ٢. مجرای فاضلاب

**ڕائەسپاردن** / řa'espardin/: ☜ **ڕاسپاردن**

**ڕائەسپاردە** / řa'esparde/: ☜ **ڕاسپاردە**

**ڕائەنگاوتن** / řa'engawtin/: چاوگ. ڕاهێشتن؛ ڕاهێلان؛ ڕاستەوڕاست درێژ کردنی شتێ بە سەر بۆشاییدا ‹تەنافەکە ڕائەنگێوە؛ دارمان بە سەر خانووەکەدا ڕائەنگاوت› ≡ افقی انداختن

**ڕابارتن** / řabartin/: چاوگ. دانە سەر؛ تێپەڕاندن ≡ گُذراندن

**ڕابر** / řabir/: ناو. ڕێبەندان ≡ راهبندان

**ڕابران** / řab(i)ran/: چاوگ. تێپەڕین؛ بە سەر چوون ‹ئارێ برا، وا ڕابرا «هەژار، *چوار نامیلکە*»› ≡ گذشتن

**ڕابردن** / řabirdin/: چاوگ. ڕابگردن؛ ڕابوردن؛ ڕابووردن: ١. تێپەڕ بوون؛ بە سەر چوون ‹هەناسەم زولفەکەی لادا و مەیلێکی نەکرد چاوی/ نەسیم ئەنگووت و شەو ڕابرد و نەرگس هەر لە خەودایە «نالی»› ٢. ڕۆیشتن؛ تێپەڕ کردن ‹حیکایەتخوان سپی هەڵگەڕا و لەرزی و ملی لێ نا کە: تۆز هات و ڕابرد و سەد ئالای نیشانەی یەک ملیۆن لەشکر ... دەرکەوت! «هەژار، *چێشتی مجێور*»› ≡ ١. سپری شدن ٢. گذر کردن

**ڕابردوو**[1] / řabirdû/: ناو. ڕابردە؛ ڕابووردە؛ ڕابووردوو؛ ڕابوردوو؛ ڕابووری؛ بووردە؛ بگردگ؛ ویەردە؛ زووتە؛ سەراوەرد؛ گوزەشتە؛ کاتێ پێش لە ئێستا ‹لە ڕابردوودا شتی وا هەر نەبووە› ≡ گذشته؛ سپری شده

**ڕابردوو**[2]: ئاوەڵناو. ڕابردە؛ ڕابووردە؛ ڕابووردوو؛ ڕابوردوو؛ ڕابووری؛ تێپەڕیو؛ سەر بە کاتی پێشوو ‹بە سەرسامی لەسەر لووتکەی بلندی گەنجی وەستاوم/ شریتی عومری ڕابردووم وەکوو خەو دێتە بەرچاوم «هەردی»› ≡ گذشته

**ڕابردە** / řabirde/: ☜ **ڕابردوو**

**ڕابڕ** / řabiř/: ناو. ڕێبڕ؛ ڕێگر؛ ڕێبەر؛ ڕێگیر؛ گۆران؛ چەتە ≡ راهزن

**ڕابگار** / řab(i)gar/: ☜ **ڕێبوار**

**ڕابگردن** / řab(i)girdin/: ☜ **ڕابردن**

**ڕابوار** / řab(i)war/: ☜ **ڕێبوار**

**ڕابواردن** / řab(i)wardin/: چاوگ. ١. تێپەڕاندن؛ ڕابارتن؛ دانەسەر ‹هاتمەوە قاوەخانە. ئەو شەوەشم بە برسیاتی ڕابوارد «هەژار، *چێشتی مجێور*»› ٢. */کینایە/* خۆش ژیان ‹بەلام ئەگەر لاوان خەریکی ڕابواردن و ئارەق خواردن بوونایە، نیعمەت بوو؛ بەرق تا درەنگانی شەو هەبوو «هەژار، *چێشتی مجێور*»› ≡ ١. گذراندن ٢. خوشگذرانی کردن

**ڕابوردن** / řaburdin/: ☜ **ڕابردن**

**ڕابوردوو** / řaburdû/: ☜ **ڕابردوو**

**ڕابووردن** / řabûrdin/: ☜ **ڕابردن**

**ڕابووردوو** / řabûrdû/: ☜ **ڕابردوو**

**ڕابووردە** / řabûrde/: ☜ **ڕابردوو**

**ڕابووری** / řabûrî/: ☜ **ڕابردوو**

**ڕابوورین** / řabûrîn/: چاوگ. دانەسەر؛ ڕابواردن ≡ گذراندن

**ڕابـوون / řabûn/**: چـاوگ. ڕابـین: ١. هەسـتان؛ بەرزەوە بـوون ٢. سـەر هەڵـدان؛ ڕاپـەڕین ⚟ ١. برخاستن ٢. قیام کردن

**ڕابـەر / řaber/**: نـاو. ڕێبـەر؛ ڕەهبـەر؛ شـارەزای پێشڕەو ‹ئەو دەمەش ڕۆڵەی پرۆلیتاری کورد/ دەبنە ڕابەر بۆ وڵاتی کوردسان «قانع»› ⚟ رهبر

**ڕابەرتن / řabertin/**: چاوگ. ڕابارتن؛ تێپەڕاندن ⚟ گذرانیدن

**ڕابەردار / řaberdar/**: ئاوەڵناو. ١. بەردار؛ ڕجـوا ٢. ڕازی؛ ڕەزا؛ قایل ‹خودا ڕابەردار نییـە› ⚟ ١. روا ٢. راضی

**ڕابـەری / řaberî/**: نـاو. ڕێبـەری؛ شـارەزایی ⚟ رهبری

**ڕابەزانـدن / řabezandin/**: چاوگ. ١. شـەڕەچەقە کردن؛ کێشە و هەرا کردن ٢. دەرەقەت هاتن ⚟ ١. مُجادله کردن ٢. شکست دادن

**ڕابەستن / řabestin/**: چاوگ. ١. بـە خـۆوە قـایم کردن ‹فیشـەکدانەکەی ڕابەسـت› ٢. جووڵانـەوە؛ ڕەفتار کردن ⚟ ١. چیزی بـه خـود بسـتن ٢. رفتـار کردن

**ڕابەڵ / řabel/**: ئاوەڵناو. قەڵس؛ تووڕە ⚟ عصبانی

**ڕابەننان / řabennan/**: ☜ ڕێبەندان ـ٢

**ڕابی / řabî/**: ناو. ڕێزناوێکە بۆ مەلایانی جوولەکە و ئاشووری، بە واتای مامۆستا ⚟ رابی

**ڕابین / řabîn/**: ☜ ڕابوون

**ڕابینۆک / řabînok/**: ناو. جۆلانێ؛ دێلەکانێ ⚟ تاب

**ڕابینی / řabînî/**: نـاو. ١. دۆخی بڕوا پێ بوون؛ بڕوا بـە دروسـتکاری، ڕاسـتبێـژی یـان کارامـەیی کەسێک ‹جا ئەگەر ڕابینی پێ نەبوو، بۆ ئـەو کـارەی پێ ئەسـپارد؟› ٢. بـاوەڕی؛ تـێڕادیـوی؛ ڕەوت و چۆنیەتی ڕکان؛ ڕاپـەرمان؛ ڕاپـەرموون؛ پـەرمان؛ پشت پێ بەستن لە سۆنگەی ئەم باوەڕەوە ‹من بە ڕابینی تۆوە هاتمە ئەم ماڵە› ⚟ ١. اعتماد ٢. اتکا

**ڕابینین / řabînîn/**: چاوگ. ڕاپەرمان؛ ڕاپـەرموون: ١. تـێڕادیـن؛ بـڕوا/ بـاوەڕ پـێکـردن؛ پـەرمان؛ پەرمین؛ پەرمەی؛ پشت پێ گرێدان ٢. پشت پێ بەستن ⚟ ١. اعتماد کردن ٢. اتکا داشتن

**ڕابێژ / řabêj/**: ☜ ڕاوێژ

**ڕابێژگە / řabêjge/**: ☜ ڕاوێژگە

**ڕابێژەک / řabêjek/**: ☜ ڕاوێژ

**ڕاپـازین / řapazîn/**: چـاوگ. گووشـین: ئـەلف) گووشینی شتی ئـاوەکی وەک پـەنیر و خەسـت کردنەوەی ب) گووشینی جلوبەرگی تەڕ ⚟ الف) فشردن ب) چلاندن

**ڕاپاندن / řapandin/**: چـاوگ. داپۆشین؛ شاردنەوە ⚟ پنهان کردن

**ڕاپسان / řap(i)san/**: چاوگ. ڕاپسـکان؛ پسـکان؛ لەپڕ جیا بوونەوە ⚟ قطع شدن

**ڕاپسـاندن / řap(i)sandin/**: چـاوگ. ڕاپسـکاندن؛ ڕفاندن؛ قۆزتنەوە ⚟ ربودن

**ڕاپسکان / řapiskan/**: ☜ ڕاپسان

**ڕاپسکاندن / řapiskandin/**: ☜ ڕاپساندن

**ڕاپسـکاوتن / řapiskawtin/**: چـاوگ. خـەلاس کردن؛ بەر دان ‹شەوێک ژنێک پیلی کێشـام: وەرە بڕۆین! خۆم لـە دەسـتی ڕاپسـکاوت! گرتمیـەوە ... «هەژار، چێشـتی مجێـور»› ⚟ رهـا کـردن؛ بیـرون کشیدن

**ڕاپـۆرت / řaport/**: نـاو. ڕاپـۆڕ؛ بـەدی؛ خەبـەری ڕووداو ⚟ راپُرت؛ گزارش

**ڕاپۆرتچی / řaportçî/**: نـاو. کەسـێ کـە خەبـەری ڕووداو بۆ گەورە دەنووسێ ⚟ گزارشگر

**ڕاپـۆڕ / řapoř/**: نـاو. ١. کـار و ڕەوتی ئـاخنین؛ پەستوان؛ بە نهێم خستنە ناو ٢. ☜ ڕاپـۆرت ⚟ ١. آگنه با فشار ٢. ☜ ڕاپۆرت

**ڕاپۆڕانـدن / řapořandin/**: چـاوگ. پەسـتاوتن؛ ئاخنین؛ بە زۆر دە ناو نان ⚟ چپانیدن؛ با فشار فـرو

کردن

**ڕاپەرکاندن / řaperkandin/**: چاوگ. ڕاپەلکاندن: ١. پێ‌هەڵچوون (بە دار و چیادا) ٢. چەمۆڵە دادان (سەگ و پشیلە و ...) ☰ ١. بالا رفتن (از درخت و کوه) ٢. بر دو دست خوابیدن (سگ و گربه و ...)

**ڕاپەرمان / řaperman/**: ☜ ڕابینین

**ڕاپەرموون / řapermûn/**: ☜ ڕابینین

**ڕاپەڕ / rapeř/**: ناو. توند و تۆڵی؛ گورج و گۆڵی؛ چالاکی ☰ چالاکی

**ڕاپەڕاندن / rapeřandin/**: چاوگ. ١. کار پێک‌هێنان بە مەزبووتی؛ ئەنجام‌دانی ئازایانە ‹بە دڵسۆزییەوە کارەکانی ڕاپەڕاند› ٢. ژ خەو ڕاکرن؛ لە خەو داچڵەکاندن ‹پەردەی بێدەنگی دادڕاند/ خەوالووی لە خەو ڕاپەڕاند «هێمن»› ☰ ١. چالاکانە انجام دادن ٢. از خواب پراندن

**ڕاپەڕین[١] / rapeřîn/**: چاوگ. ١. ڕاست بوونەوەی گەل دژی حوکمەت ‹ئەی کوردی نەبەز! هەموو ڕاپەڕن/ لەغاوی پیسی شەڕگێر هەڵدڕن! «کامەران موکری»› ٢. لەپڕ بڵند بوون؛ زوو هەستان ٣. گورج دەست بە کار بوون ٤. داچڵەکان؛ داچڵەکیان؛ هەڵبەزین ٥. داچڵەکان؛ داچڵەکیان؛ لە نەکاو لە خەو هەستان ‹سەدەی بیستەمە، کوردە غیرەتێ/ لە خەو ڕاپەڕە، هەوڵێ هیممەتێ «بێکەس»› ☰ ١. انقلاب کردن ٢. ناگهان خیز برداشتن ٣. سریع دست به کار شدن ۴. یکه خوردن ۵. ناگهان از خواب پریدن

**ڕاپەڕین[٢]**: ناو. *[ڕامیاری]* شۆڕش؛ کاری هەستانەوە و تێکۆشان بۆ بە دەست هێنانی ئازادی و تاقمێ مافی‌تر ‹دەمی ڕاپەڕینە دەمی ڕاپەڕین/ هەتا کەی بە سستی و بە پەستی بژین؟ «گۆران»› ☰ قیام

**ڕاپەڕیو / rapeřîw/**: ☜ ڕاچەنیو

- **ڕاپەڕێن / řapeřên-/**: پاشوشە. وە خەبەرهێن ‹خەڵک‌ڕاپەڕێن› ☰ بیدارکننده

**ڕاپەژلین / řapejlîn/**: چاوگ. چوونە سەر؛ سەرکەوتن (بە نەردیواندا) ☰ بالا رفتن (از نردبان)

**ڕاپەلقین / řapelqîn/**: چاوگ. کوشین؛ گووشین (لە مستدا) ☰ افشُردن

**ڕاپەلکاندن / řapelkandin/**: ☜ ڕاپەرکاندن

**ڕاپەلین / řapelîn/**: چاوگ. پەڕینەوە (لە ئاو و رووباران) ☰ عبور کردن

**ڕاپیتە / řapîte/**: ناو. ڕاوێچکە؛ هات‌وچۆی بە پەلە و ئەو سەر و ئەم سەر ☰ آمد و رفت با شتاب در یک جا

**ڕاپێچ / řapêç/**: ناو. ١. ڕێنوێنی ‹لەو ڕۆژەدا بۆ لای پەروەردگارت ڕاپێچ دەکرێیت› ٢. ڕاماڵ ‹شنەبایە و گەردی خەمان ڕاپێچ دەکا!› ☰ ١. هدایت ٢. عمل یا فرایند جلو انداختن و روبیدن

⊡ **ڕاپێچ کردن**: ☜ ڕاپێچان

**ڕاپێچان / řapêçan/**: چاوگ. ڕاپێچ کردن: ١. وە بەر خۆ دان و بە غار بردن ٢. بەرهەڤ بوون؛ خۆ گورج کردنەوە ٣. ڕاماشتن؛ ڕامالین ☰ ١. جلو انداختن و با شتاب بردن ٢. آماده شدن ٣. جمع کردن

**ڕاپێچەک / řapêçek/**: ناو. ڕەپێچکە؛ ڕاماڵ ☰ رُفت‌وروب

⊡ **ڕاپێچەک دان**: ڕەپێچکە دان؛ ڕاماڵ دان ‹خەڵکیان بۆ ناو هۆڵەکان ڕاپێچەک دا› ☰ با شتاب راندن و بردن

**ڕاتب / řatib/**: ناو. ١. جیرە؛ بژیوێ کە دەدرێ بە دەرسخوێن و کارکەری دەوڵەت ٢. ئەو کەل‌وپەلەی ڕاوکەر لە پشتی خۆیانی دەبەستن ☰ ١. جیره؛ مواجب ٢. وسایلی که صیاد با خود دارد

**ڕاتبە / řat(i)be/**: ☜ ڕاتوە

**ڕاتڵەقان / řat(i)łeqan/**: ☜ ڕاتڵەکان

**ڕاتڵەقاندن / řat(i)łeqandin/**: ☜ ڕاتڵەکاندن

**ڕاتڵەقانن / řat(i)łeqanin/**: ☜ ڕاتڵەکاندن

**ڕاتڵەکان / řat(i)łekan/**: چاوگ. ڕاتڵەقان: ١.

ڕاشەکان؛ هەژانی دەفری جێ تراو ٢. ڕاوەشان و سوور خواردنی شتی وەک بێژ و کەو ☰ ١. تکان خوردن ظرف مایعات ٢. چرخیدن غربال

**ڕاتڵەکاندن / řat(i)łekandin/**: چاوگ. ڕاتڵەقاندن؛ ڕاتڵەقان: ١. هەژاندنی دەفری جێ تراو ٢. ڕاوەشاندن و سوور هەڵدانی شتی وەک بێژ و کەو بۆ پاک کردنی دەغڵ و ... ☰ ١. تکان دادن ظرف مایع ٢. چرخاندن غربال

**ڕاتڵەکاو / řat(i)łekaw/**: ناوەڵناو. شڵەژاو؛ شڵەژیو ☰ یکەخورده

**ڕاتوە / řat(i)we/**: ناو. ڕاتبە؛ ڕاتوو؛ خێری نان و پێداویستی کە بە فەقێ دەدرێ ☰ بخشش بە طلبەی علوم دینی

**ڕاتۆڵ / řatoł/**: ناوەڵناو. ڕاتووڵ: ١. ئاوارە ٢. گەڕۆک؛ گەڕیدە ☰ ١. آوارە ٢. سیّاح

**ڕاتو / řatû/**: ☜ ڕاتوە

**ڕاتوڵ / řatûł/**: ☜ ڕاتۆڵ

**ڕاتەکان / řatekan/**: چاوگ. جووڵانی بە توندی ☰ تکان خوردن شدید

**ڕاتەکاندن / řatekandin/**: چاوگ. ڕاشەکاندن: ١. تەکان پێ دانی توند ‹خۆم ڕاتەکاند و لە دەستی خەلاس بووم› ٢. تەکاندنی شتی وەک ڕایەخ لە شوێنی خۆیەوە ‹چووە سەربان فەرش ڕاتەکێ بە فەرشەکەوە بەر بۆوە!› ☰ ١. تکان دادن شدید ٢. تکانیدن پارچە و زیرانداز

**ڕاتەوراندن / řatewrandin/**: چاوگ. کۆز کردن؛ بەستنەوەی وڵاخان بۆ لەوەڕاندن ☰ بستن چهارپایان در چراگاه

**ڕاجفرین / řacifrîn/**: چاوگ. ڕاجلفین؛ ڕاچەنین ☰ یکه خوردن

**ڕاجلفین / řacilfîn/**: چاوگ. ڕاچەنین؛ داچڵەکان ☰ یکه خوردن

**ڕاجە / řace/**: ناو. ١. پەیاغ؛ داردەستی درێژ ٢. کاریتەی خانوو ٣. ڕەگەز ☰ ١. چوبدستی بلند ٢. الوار سقف خانه ٣. نژاد

**ڕاچ / řaç/**: ☜ ڕاچە[2]

**ڕاچاڤ / řaçav/**: ناو. پاسەوان؛ نۆگەچی؛ زێرەڤان ☰ نگهبان

**ڕاچاندن / řaçandin/**: چاوگ. داچاندن؛ ڕایەڵ کردن؛ ڕێز کردنی داوی چنین بۆ تێوەدانی پۆ ☰ ردە کردن تار بافتنی

**ڕاچاو / řaçaw/**: ☜ ڕەچاو

⊡ **ڕاچاو کرن**: ☜ ڕەچاو کردن

**ڕاچڕاندن / řaç(i)řandin/**: چاوگ. ڕاستەوڕاست دڕاندن ☰ پارە کردن در یک خط

**ڕاچڵەکان / řaç(i)łekan/**: ☜ ڕاچەنین

**ڕاچڵەکاندن / řaç(i)łekandin/**: ☜ ڕاچەناندن

**ڕاچڵەکین / řaç(i)łekîn/**: ☜ ڕاچەنین

**ڕاچڵەکیو / řaç(i)łekîw/**: ☜ ڕاچەنیو

**ڕاچنین / řaç(i)nîn/**: چاوگ. ڕاهێڵ کردن؛ ڕیز کردنی داوی تەون یان بووزوو ☰ ردیف کردن تارهای بافتنی

**ڕاچواندن / řaç(i)wandin/**: چاوگ. تێڕا کردن؛ تێهەڵچەقاندن ☰ فرو کردن

**ڕاچوون / řaçûn/**: چاوگ. تێهەڵچەقین؛ تێڕوو بوون ‹بە سەد دوکتۆر و دەرمان و پەرستار ناکرێ چارەی/ کەسێک تیری مژۆڵی ئەو کچە کوردەی لە دڵ ڕاچێ «هێمن»› ☰ خلیدن

**ڕاچە[1] / řaçe/**: ناو. ڕاجە؛ ڕاژ: ١. دارەڕای خانوو ٢. باسکێشی ئاموور ٣. بەرچیغ ☰ ١. الوار بر سقف ٢. سنج خیش ٣. چوب میخ چیغ

**ڕاچە[2]**: ناوەڵکار. ڕاچ؛ بۆچی؛ ئەڕای چە؛ لە بەر چی ☰ چرا

**ڕاچەران / řaçeran/**: ☜ ڕاچەنین

**ڕاچەراندن / řaçerandin/**: ☜ ڕاچەناندن

**ڕاچەفت / řaçeft/**: ناوەڵناو. *[کینایە]* کەمئاوەز و

تەگبیرنەزان ☰ احمق
**ڕاچەڵکاندن** / raçełkandin/: ☜ **ڕاچەناندن**
**ڕاچەڵکین** / raçełkîn/: ☜ **ڕاچەنین**
**ڕاچەناندن** / řaçenandin/: چاوگ. *[سەجاز]* ڕاچڵەکاندن؛ داخورپاندن؛ ڕاچەراندن؛ لەپڕ ترساندن ☰ ناگهان ترساندن
**ڕاچەنین** / řaçenîn/: چاوگ. ڕاچڵەکان؛ ڕاچڵەکین؛ داخورپان؛ ڕاچەران؛ داچڵەکیان؛ ڕاچەڵکین؛ لە ترس یا خەبەری سەیر و سەمەرە داترووسکان ⟨ڕاچەنی لەم وتەیە پیرەهەڵۆ/ هاتە بەرچاوی گەلێ کەندوکڵۆ «هەژار، *بۆ کوردستان*»⟩ ☰ یکّە خوردن
**ڕاچەنیو** / řaçenîw/: ئاوەڵناو. ڕاپەڕیو؛ ڕاچڵەکیو؛ داچڵەکیاگ. هەروەها: **ڕاچەنیوی** ☰ یکەخوردە
**ڕاچێتە** / řaçête/: ناو. نوشتە؛ نوسخە؛ ڕاسپاردەی نووسراوی پزیشک بۆ نەخۆش ☰ نُسخەی دکتر
**ڕاحەت** / řaĥet/: ☜ **ڕەحەت**[2]
**ڕاحەتخوەر** / řaĥetx(i)wer/: ئاوەڵناو. *[پەلار]* ئاسانبژیو ⟨ڕاحەتخوەر و قەراخنشین «مەسەل»⟩ ☰ سایەنشین
**ڕاحەتی** / řaĥetî/: ☜ **ڕەحاتی**
**ڕاخ** / řax/: ناو. ۱. گرد و کێوی سەوز لە گیا ۲. خەم؛ مەینەت ۳. بەردەڵان؛ تمتمان؛ زەوینی داپۆشراو لە بەردی گەورە و پچووک ☰ ۱. تپە و کوە سرسبز ۲. اندوە ۳. سنگلاخ
**ڕاخران** / řax(i)ran/: چاوگ. داخران؛ کەوتن و بڵاو بوونەوەی شتێ بە سەر شتێکی دیکەدا ⟨ڕۆژێک پیلی گرتم و ڕۆیشتین. چووینە شوێنێک، تاریک، ڕەش بە دووکەڵ. چەند حەسیرێک ڕاخراوە و بیست منداڵێکی وەک خۆمیان لە سەر دانیشتووە «هەژار، *چێشتی مجێور*»⟩ ☰ گُسترده شدن
**ڕاخراو** / řax(i)raw/: ئاوەڵناو. ۱. پان کراوە؛ داخریاگ ۲. بەڕێکراو؛ وە سەر ڕێگە خراو ☰ ۱. گُسترانیده ۲. راەافتادە
**ڕاخزین** / řax(i)zîn/: چاوگ. خوشین؛ ڕاخوشین؛ خزین؛ خزیان ⟨ڕاخزی ماری غەمی تۆ، کەوتە ناو کونجی دەماغ/ خۆی لە ناو سک نا بە هێزی بەختەکەی نامەردی من «ڕاجی»⟩ ☰ خزیدن
**ڕاخستن** / řaxistin/: چاوگ. ۱. تەپساندن؛ پان کردنەوەی ڕایەخ ⟨ئەزانی من شەهیدی غەمزەم ئەی قەبرەڵکەنی دڵسۆز/ لە باتی گوڵ لە قەبرا تۆخودا خارم لە بۆ ڕاخە «بێخود»⟩ ۲. بەڕێ کردن؛ بە ڕێگەدا ناردن ☰ ۱. گُستردن ۲. راەانداختن
**ڕاخستنەوە** / řaxistinewe/: چاوگ. دیسانەوە ڕاخستن ⟨ئەزانی من شەهیدی غەمزەم ئەی قەبرەڵکەنی دڵسۆز!/ لە باتی گوڵ لە قەبرا، تۆخودا خارم لە بۆ ڕاخە «بێخود»⟩ ☰ باز گُستردن
**ڕاخستی** / řaxistî/: ناو. ڕاخراو ☰ پهن‌شدە
**ڕاخشین** / řax(i)şîn/: چاوگ. ڕاخوشین: ۱. خوشین؛ شێلەهان؛ بە خز ڕۆیشتن (مار و خزۆکی‌تر) ۲. ڕاکشانی تیرئەستێرە ☰ ۱. خزیدن (خزندە و ...) ۲. تیر کشیدن شهاب
**ڕاخ‌وڕەخ** / řax û řex/: ناو. ڕەخوڕۆخ؛ دەورانەدەور ☰ دورتادور
**ڕاخوڕین** / řaxuřîn/: چاوگ. ۱. داخوڕین؛ تێخوڕین؛ داکالیان ⟨هەرات لێ دەکا هاڕەی بای وەعدە/ دە تۆ ڕادەخوڕن ئەو بەرق و ڕەعدە «حەقیقی»⟩ ۲. هانە دانی بارەبەر بۆ خۆش ڕۆیشتن ☰ ۱. نهیب زدن ۲. هی کردن حیوان
**ڕاخوشین** / řaxuşîn/: ☜ **ڕاخشین**
**ڕاخەر**[1] / řaxer/: ناو. ڕایەخ؛ ڕایاخ؛ ڕایخ؛ بەڕە و حەسیر و هەرچی لە سەر زەوی پان دەکرێتەوە ☰ زیرانداز
**ڕاخەر**[2]: ئاوەڵناو. بڵاوکەرەوە ☰ گُسترانندە
**ڕاد** / řad/: ناو. پەڕی تیری کەوان؛ چوکڵەی لای خوارووی تیر ☰ سوفار؛ پرەی تیر

**ڕادار / řadar/**: ناو. ١. چەتە؛ ڕابڕ ٢. ڕێوان؛ ئاگاداری ڕێگە ٣. باجگر؛ پیتاکوەرگر ٤. کەرەستەیەک بۆ دیاری کردنی شوێنی شتێ بە یارمەتی شەپۆلی ڕادیۆییەوە 🇮🇷 ١. راهزن ٢. راهدار ٣. باجگیر ۴. رادار

**ڕادارانە / řadarane/**: ناو. پیتاکی سەرەڕێ؛ باجێ کە لە ڕێگە دەدرێ 🇮🇷 عوارض راه

**ڕادارخانە / řadarxane/**: ناو. جێگەی باج ساندن لە سەر ڕێگە 🇮🇷 عوارضی

**ڕاداری / radarî/**: ناو. باجگری ناوەڕێ 🇮🇷 باجگیری سرراهی

**ڕاداشتن / řadaştin/**: چاوگ. ١. داکێشان؛ درێژ کردنەوە ‹مامۆستا ...یک هەبوو زۆری کار بە دەست بوو؛ دەشیناسیم کێم. لە باتی کار، پەنجا فلسییەکی بۆ ڕاداشتم! بێدەنگ بە جێم هێشت! «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. شل کردن (گوێ) ‹قەل کوتی باشە کە گوێ ڕادێری/ پەندی من پاکی بە دل بسپێری «سوارە»› ٣. گرتنی چرا بۆ کەسێک لە تاریکیدا ‹دا ئەو چرایەم بۆ ڕادێرە! هیچ نابینم› ٤. داهێشتن؛ داهێلان؛ ڕاهێشتن؛ ڕاهێلان؛ ڕیاندنی مندال لە سەر دەستان 🇮🇷 ١. دراز کردن ٢. دادن (گوش) ٣. چراغ گرفتن برای کسی ۴. بر دست گرفتن بچه برای دفع

**ڕادان[١] / řadan/**: چاوگ. ١. ئەسپاردن (بۆ ساز کردن) ‹کەوایەکم بۆت ڕاداوە، هاومالی نییە› ٢. وە بەر خۆ دان و ماشتن ‹لافاوەکەی پار هەرچیکمان بوو ڕایدا و بردی› ٣. داگیرساندنی سۆپە ‹زۆر ساردە سۆپەکە ڕادە!› ٤. هەلکشانی دەریا؛ هاتنە سەری ئاوی دەریا بە هۆی مانگ ٥. وە لا نان ٦. دەرکردن ‹من وەک نەمام، تۆ وەک باوی وادە/ لەگەل غەمی خۆت، هی منیش ڕادە «فولکلۆر»› 🇮🇷 ١. سفارش دادن (برای ساختن) ٢. روبیدن ٣. روشن کردن بُخاری ۴. مدّ شدن آب دریا ۵. کنار گذاشتن ۶ بیرون کردن

**ڕادان[٢]**: ناو. دارێ کە لەباتی گۆلە بە دەرگایەوە دەنێن 🇮🇷 چوبی کە به جای قفل پُشت در نهند

**ڕادوو / řadû/**: ناو. ڕەدوو؛ کاری هەلاتنی کچ دەگەل کوڕ، بێ پرسی دایک و باوک 🇮🇷 فرار دختر با پسر

⊡ **ڕادوو کەوتن**: کچ دەگەل کوڕ هەلاتن 🇮🇷 فرار کردن دختر با پسر

**ڕادوو نان**: کەوتنە شوێن گیاندارێک بە غار 🇮🇷 به دنبال حیوانی دویدن

**ڕادە / řade/**: ناو. ١. ئەندازە؛ شۆ؛ قاس ٢. چۆنیەتی؛ چلۆنەتی؛ چلۆنایەتی ٣. بارست؛ بارستایی ٤. کلیلی لە دار بۆ قفلی دارین ٥. کاری پڕ پێدا کردن (چەک) 🇮🇷 ١. اندازه ٢. کیفیت ٣. حجم ۴. کلید چوبی ۵. عمل برگرفتن (اسلحه)

**ڕادەر / řader/**: ناوەلناو. نۆژەن؛ تازەداهاتوو 🇮🇷 تازه ایجاد شده

**ڕادەس / řades/**: ناو. دەسترەس؛ دەردەس 🇮🇷 دسترس

**ڕادەست / řadest/**: ناو. ڕەوتی خۆ بە دەستەوە دان 🇮🇷 تسلیم

⊡ **ڕادەست کردن**: ڕادەست کرن؛ خۆ دانە دەستەوە ‹خۆم ڕادەستی قەدەر ناکەم/ دنیاش دەستم لێ بەرد بدا ئەمجارەیان/ هەرگیز دەستت لێ بەر نادەم «پەشێو»› 🇮🇷 تسلیم کردن

**ڕادەست کرن**: ☜ **ڕادەست کردن**

**ڕادەیەک / řadeyek/**: ناوەلکار. کرتێ؛ ئەندازەیەک 🇮🇷 مقداری

**ڕادیاتور / řad(i)yatur/**: ناو. ١. شۆفاژ؛ جۆرێ کەرەسەی گەرم کردنی ژوور بە کۆمەلێ لوولە و پەڕەی هلۆلەوە بۆ هاتوچووی ئاوی گەرم ٢. جۆرێ کەرەسەی فێنککەرەوەی موتوری ماشین 🇮🇷 ١و٢. رادیاتور

**ڕادیـان / řadyan/**: نـاو. *[ریـازی]* یەکـەی ئەنـدازە گرتنی کەوانە و گۆشـە، بەرانبـەر بـە ٥٧ پلـەک (دەرەجە) و ٣٠ خولەک (دەقیقە) ☰ رادیان

**ڕادیـتن / řadîtin/**: چـاوگ. تـێڕادیـن؛ پـەرمیان؛ پەرمان؛ پەرمین؛ بڕوا/ باوەڕ پێبوون؛ پشـت پـێ بەستن ‹لە شان و باهۆی خۆم ڕادی/ هەلگرم ئـالای ئازادی «هێمن»› ☰ اتکا کردن

**ڕادیکاڵ[1] / řadîkał/**: ناو. ١. *[ریازی]* نیشانەیەک بـە بیچمی $\sqrt[n]{}$ کە ئەگەر ژمارەیـێ دە ژێریـدا جـێ بگرێ، پێویستە ڕیشەی (بە پێی هەندی دیـاریکراو لە فورجەی ڕادیکاڵـدا) بەدەسـت بێـت ٢. *[ریـازی]* ڕیشەی دیـاریکراوی ژمارەیـەک ($\sqrt[2]{}$) نیشـانەی ڕیشەی دووهەم، $\sqrt[3]{}$ نیشـانەی ڕیشـەی سـێهەم و $\sqrt[n]{}$ نیشـانەی ڕیشەی nەمـی هەندێکـە) ٣. *[کیمیـا]* بنەما؛ پێز ☰ ١تا٣. رادیکال

**ڕادیکاڵ[2]**: ئاوەڵناو. *[رامیاری]* ١. بنیاتخواز؛ بنەماخواز؛ بنەڕەتخواز؛ لایـەنگری گۆڕانکـاری بنـەڕەتی لـە بنەما، شێواز یان پێکهاتەکان ‹حیزبی ڕادیکاڵ› ٢. توندوتیژ ‹هێزە ڕادیکاڵەکان› ☰ ١و٢. رادیکال

**ڕادیکاڵیـسـم / řadîkałîsm/**: نـاو. *[رامیـاری]* ١. بنیاتخوازی؛ بنەماخوازی؛ بنەڕەتخوازی ٢. توند و تیژی ☰ ١و٢. رادیکالیسم

**ڕادیوم / řadyum/**: ناو. توخمی کیمیایی کـانزایی ڕادیۆئەکتیڤ بـە ژمـارەی ئـەتومی ٨٨ و کێشـی ئـەتومی ٢٢٦,٠٢ کـە کانزایـەکی سـپی و بریقەداری ژاراوییە لە دەوا سازیدا بەکار دێ. لـە هەڵوەشانەوەی ئەم توخمە ڕادون بـەدی دێ ☰ رادیُم

**ڕادیۆ / řadyo/**: ناو. ١. ئامرازی ڤـەگری شـەپۆلی دەنگیی کە لـە لایـەن ئێزگەیێکـەوە دەنێـردرێ ‹ڕادیۆی سێ‌مـەوج› ٢. *[مەجاز]* ئێزگـەی نـاردنی شەپۆلی دەنگی ‹ڕادیـۆ کرماشـان› ☰ ١. رادیـو ٢. ایستگاه رادیویی

**ڕادیۆئـەکتیڤ / řadyo'ektîv/**: ئاوەڵـناو. تیشـکزا؛ تیشـکدەر؛ بـە تایبەتمەنـدی یـان هێـزی تیشکدانەوەوە ☰ رادیوآکتیو

**ڕادیۆئـەکتیڤیتـە / řad(i)yo'ektîvîte/**: نـاو. تیشکدەری؛ تیشکزایی ☰ پرتوزایی؛ رادیواکتیویته

**ڕادیۆسکۆپی / řadyoskopî/**: ناو. کـاری چـاو لـە شتێک کردن (بەتایبەت ئەندامی نەخۆش) لە ڕێـی کێشانی وێنەیەک لە ئەو ئەندامە، بە کەرەسـەی ڕادیۆگرافی ☰ رادیوسکپی

**ڕادیـۆگرافی / řadyog(i)rafî/**: نـاو. کـار و ڕەوتی وێنە گرتن بە تیشکی ئیکس ☰ رادیوگرافی

**ڕادیۆلۆجی / řadyolocî/**: ☜ **ڕادیۆلۆژی**

**ڕادیۆلۆجیست / řadyolocîst/**: ☜ **ڕادیۆلۆژیست**

**ڕادیۆلـۆژی / řadyolojî/**: ناو. ڕادیۆلـۆجی؛ تیشـک؛ وێنەگەری پزیشـکی: ١. یـەکێک لـە بوارەکـانی پزیشکییە کە لە تیشکی ئیکس و شەپۆلەکانی‌تـر بۆ ناسینەوە و چارەسـەر کـردنی نەخۆشـییەکان کەڵک وەردەگرێ ٢. دامەزراوە یان شوێنێک کە ڕادیۆگرافی تێدا ئەنجام دەدرێ ☰ ١و٢. رایولُژی

**ڕادیۆلۆژیست / řadyolojîst/**: نـاو. تیشـکنـاس؛ ڕادیۆلۆجیست؛ پسپۆڕی ڕادیۆلۆژی ☰ رادیولژیست

**- ڕادێـر / -řadêr/**: پاشەوشـە. ـــ دەر؛ ـ گـر ‹ساز و ئامادە، وەکوو نۆکەری گـوێڕادێـرم/ چاومـە بەنـدی ئیشارەی ئەوە، گوێش بۆ فەرمان «ئاوات»› ☰ ـ دار

**ڕادێـران / řadêran/**: چـاوگ. ١. لـە سـەرەوە بـۆ خوار، شـۆڕ کردنـەوە (تـەناف و ...) ٢. شـتێ بـە تەناف و ... بەرەو خوار ناردن ☰ ١. فرو داشـتن ٢. پایین فرستادن (با تناب و ...)

**ڕاڕ / řař/**: ئاوەڵـناو. ١. هەڵاهەلا؛ لە بەر یەک بـڵاو بوو ‹گۆشتەکە هێند کوڵیوە ڕاڕ بووە› ٢. دڕ؛ دڕنـە؛ دڕندە ☰ ١. لهیده از حرارت ٢. درنده

**ڕاڕا / řařa/**: ئاوەڵـناو. ١. وازوازی؛ وازیوازی؛ هـەر دەم لـە سـەر هەوایـەک ٢. خـەتـخـەت ☰ ١.

دمدمی‌مزاج ٢. راه ـ راه

**ڕاڕایی / řařayî/:** ئاوەڵناو. وازوازی ‹لە سەر ئەو دەنگ و ئاوازە، دەبا شەیتانی ڕاڕایی/ سەمی پڕتەوسی بێشەرمی بکا بۆ عەشقی کۆتایی «هەردی»› ☰ دمدمی

**ڕاڕفان / řař(i)fan/:** چاوگ. ڕاڕفاندن؛ ڕاڕفین؛ ڕاڕەڤان؛ ڕافڕان؛ ڕافڕاندن؛ ڕافڕین؛ هەڵگرتن و بردن و هەڵاتن ‹شەتتی میحنەت هات لە سەردا، سەددی هۆشی ڕاڕفاند/ بادی غەم لێم بوو بە شەرکێ، جیسری شادیم تێک‌شکا «سالم»› ☰ ربودن

**ڕاڕفاندن / řař(i)fandin/:** ☜ ڕاڕفان

**ڕاڕفین / řař(i)fin/:** ☜ ڕاڕفان

**ڕاڕفێن / řař(i)fên/:** ناو. ڕافڕێن؛ کەسێ کە شت دەڕفێنێ ☰ رُباینده

**ڕاڕەڤ / řařev/:** ☜ ڕاڕەو

**ڕاڕەڤان / řařevan/:** ☜ ڕاڕفان

**ڕاڕەو / řařew/:** ناو. ڕاڕەڤ: ١. ڕێ‌گوزەر؛ ڕەواز؛ ڕێباز؛ ڕێگەی هات‌وچۆی گشتی ٢. ڕێبوار ‹تالیبی لێوین و ئەڵقەی زوڵفمان نیشان دەدا/ ڕاڕەوی میسرین و ئەو ڕوومان لە مولکی چین دەکا «نالی»› ٣. دالان؛ بۆشاییەکی زۆرتر درێژ و باریک لە ماڵدا کە هۆدەکان ئەباتەوە سەر پلیکان یان درگای دەرەوە ☰ ١. راه عبور ٢. رهرو ٣. راهرو

**ڕاز[1] / řaz/:** ناو. ١. سر؛ نهێنی؛ ڕووداوێ کە لە دیتران دەشاردرێتەوە ‹ڕاز کەوتە زارێک، ڕاست کەوتە شارێک «مەسەل»› ٢. شاخی بڵند؛ تیشە بەردی سەر کێو ٣. چیرۆکی کورت ‹ئەیدا وەخت خەو دایەگەورەکان/ بە ڕازگەل خوەشەو منالیان ئەخەفان «حەقشناس»› ٤. قسەی دۆستانە ‹پرکێشی ناکەم دەربڕم ڕازم/ چۆن گوێ ناگری تۆ لە ئاوازم «فولکلۆر»› ☰ ١. راز ٢. صخرەی بزرگ یکپارچە در بالای کوه ٣. داستان کوتاه ٤. گفتگوی دوستانه

▣ **ڕازی نەدرکاو:** سڕی ئاشکرا نەبوو ☰ راز سربەمهر

▣ **ڕاز کرن:** لە خوا پاڕانەوە بە سرتە ☰ زیر لب مناجات کردن

**ڕاز[2]:** ئاوەڵناو. سەر؛ بان ‹ڕازی کانی؛ ڕازی بەردی› ☰ بالا

**ڕازاڤ / řazav/:** ☜ ڕازاوە ـ٢

**ڕازان / řazan/:** چاوگ. ڕاژان؛ ڕازیای: ١. ڕاکەتن؛ ڕاکشان؛ پاڵ کەفتن؛ هەڵاژیان؛ خۆ درێژ کردنەوە ٢. خەوتن؛ خەفتن؛ نووستن؛ نڤستن ٣. ئامادە بوون؛ خۆ کار کردن ‹تا خان بڕازێ، لەشکر ئەترازێ «مەسەل»› ☰ ١. دراز کشیدن ٢. خوابیدن ٣. آمادە شدن

**ڕازاندن / řazandin/:** چاوگ. ١. خەواندن؛ نواندن؛ دە خەو کردن ٢. ڕازاندنەوە؛ جوان کردن ‹مێخەک گەردنی هەڵئەقرتێنن/ سنگ و بەرۆکی پێ ئەڕازێنن «پیرەمێرد»› ☰ ١. خواباندن ٢. آراستن

**ڕازاندنەوە / řazand(i)newe/:** چاوگ. تێپەڕ. //ڕازاندتەوە؛ دەڕازێنیەوە؛ بڕازێنەوە// ڕازاندن؛ ڕازاننەوە؛ ڕازانن؛ ڕازنای؛ خەملاندن؛ تەوزاندن؛ جوان کردن؛ نەژرنایش؛ ڕێک‌وپێک نیشاندان ☰ زینت دادن؛ آراستن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەڕازاندنەوە

**ڕازانن / řazanin/:** ☜ ڕازاندنەوە

**ڕازاننەوە / řazannewe/:** ☜ ڕازاندنەوە

**ڕازانەوە / řazanewe/:** چاوگ. تێنەپەڕ. //ڕازایەوە؛ دەڕازێیەوە؛ بڕازێوە// جوان بوون ☰ آراستە شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ڕازاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەڕازانەوە

**ڕازاو / řazaw/:** ئاوەڵناو. خەملاو ☰ آراستە

**ڕازاوە / řazawe/:** ئاوەڵناو. ١. جوان؛ شەنگ ٢. ڕازاڤ؛ خەملاو؛ جوان‌کراو ‹بە ڕاستی کە دەڵێن پاریس بووکی جیهانە، ڕاست دەکەن... لە جوان کردنی شاردا هیچ دریغی نەکراوە و بووکی ڕازاوەی

خەیاڵـە «هـەژار، چێشـتی مجێـور»» ⇆ ١. زیبـا ٢. آراسته

▣ **ڕازاوە کردن:** جوان و خـەملاو کـردن ‹سـنعەت بکەن بـە هێـز و گریکـی ولاتەکـەت/ ڕازاوە کـەن شەقام و تەلار و قەسر قسوور «قانع»›. هـەروەها: **ڕازاوە بوون** ⇆ آراسته کردن؛ زینت کردن

**ڕازایی / řazayî/:** ئاوەڵـناو. نووسـتوو؛ خـەوتوو ⇆ خوابیده

**ڕازبێژ / řazbêj/:** نـاو. چیرۆکبێژ؛ ئەوەی داسـتان دەڵێتەوە ⇆ داستانگو

**ڕازپارێز / řazparêz/:** ☜ **ڕازدار**

**ڕازتـن / řaztin/:** چـاوگ. دووریـــن؛ دوورانـــن ⇆ دوختن

**ڕازدار / řazdar/:** ئاوەڵـناو. ڕازیار؛ ڕازڤان؛ ڕازوەشێر؛ ڕازهەڵـگر؛ ڕازگـر؛ ڕازڕاگـر؛ ڕازپـارێز؛ ڕازوەشـێر؛ پەردەپۆش؛ سرقایم؛ دەمقورس؛ پـارێزەری ڕازی دیتران ⇆ رازدار

**ڕازراڤ / řazrav/:** ئاوەڵـناو. خۆشتام؛ خـۆشچێـژە؛ بەتام ⇆ خوشمزه

**ڕازڕاگر / řazřagir/:** ☜ **ڕازدار**

**ڕازڤان / řazvan/:** ☜ **ڕازدار**

**ڕازقی / řaz(i)qî/:** ناو. ١. یاسی ڕازقی؛ دارچکێکی گەڵاپانە لە تیرەی زەیتوون کە گوڵەکەی بۆنێکی زۆر خۆشی هەیە ٢. جۆرێ ترێ ⇆ ١. یاس رازقی ٢. نوعی انگور

**ڕازگر / řazgir/:** ☜ **ڕازدار**

**ڕازمان / řazman/:** ناو. دیکۆراسیون ⇆ دکوراسیون

**ڕازناو / řaznaw/:** ناو. نـاوی نهـێنی: ١. وتـە یـا ناوێکی نهێنی بڕیاردراو بۆ هاتوچۆ بە شوێنێکی تایبەتدا ٢. وشەی تێپەڕین لە ماڵپەڕ و کەرسـتە ئێلێکترونییەکان ⇆ ١. اسم شب ٢. گذرواژه

**ڕازنای / řaznay/:** ☜ **ڕازاندنەوە**

**ڕازنوس / řaznûs/:** ناو. سکاڵانووس ⇆ عریضەنویس

**ڕازوند / řazwind/:** ناو. پلیکان؛ پلەکان ⇆ پلکان

**ڕازونیـاز / řaz û n(i)yaz/:** نـاو. وتـوێـــژی خۆشەویستانە ‹دەگـەڵ خـودای خۆیـدا ڕازونیـازی دەکرد› ⇆ رازونیاز

**ڕازوەشێر / řazweşêr/:** ☜ **ڕازدار**

**ڕازوونە / řazûne/:** ناو. خواجەنشین؛ سەکۆی پـاڵ دەرگا ⇆ سکوی کنار در

**ڕازە / řaze/:** ناو. ١. ڕاز؛ ڕاس؛ چیرۆکـی خەیاڵـی ٢. هۆ، ئامراز یان کار و هونەری ڕازاندنـەوە ⇆ ١. افسانه ٢. آرایه

**ڕازەن / řazen/:** ناو. ڕازین؛ ڕێگر؛ چەتە؛ گـوران ⇆ راهزن

**ڕازەوان / řazewan/:** نـاو. شـاخەوان؛ کـەورەوان؛ تاشەوان؛ کەسێ کە بـە شـاخاندا هەڵـدەچێ ⇆ صخرەنورد

**ڕازەوانی / řazewanî/:** ناو. شاخەوانی؛ کـەژەوانی؛ کەژوانی ⇆ کوهنوردی

**ڕازهەڵگر / řazhełgir/:** ☜ **ڕازدار**

**ڕازی / řazî/:** ئاوەڵناو. ١. قایـل؛ قـادێ ‹ڕازی نابـێ لێـرە بخوێنـێ› ٢. دڵـخۆش؛ ڕەزامەنـد ‹ئـەو لـە کارەکەی ڕازییە› ⇆ ١. راضی ٢. خشنود

**ڕازیار / řazyar/:** ☜ **ڕازدار**

**ڕازیانـک / řaz(i)yanik/:** نـاو. گژنیـژە کێویلـە ⇆ گشنیز وحشی

**ڕازیانە / řaz(i)yane/:** ناو. ڕاژانە؛ ڕەزنـە؛ ڕەزیانـە؛ ڕێزیانە؛ ڕزیانک؛ هەبۆسان؛ هەپۆسـان؛ گیایـەکی ئالیکی و بۆنخۆشە بە ڕیشووی قایم، لاسکی بەرز، بەری درێژی کەسک و تـامی شـیرینەوە کـە بـۆ دەرمان دەشێ ⇆ رازیانه

**ڕازیانەتونە / řaz(i)yanetûne/:** ناو. گیایەکـە ⇆ گیاهی است

**ڕازیانەڕۆمی / řaz(i)yanerômî/:** ☜ **ڕازیانەکێویلە**

**ڕازیانەکێویلـــە / řaz(i)yanekêwîle/:** نـــــاو.

ڕازیانەڕۆمی؛ گیایەکە بۆ چارەسەر کردنی بەردی گورچیلە بەکەڵکە 🇮🇷 انیسون؛ بادیان رومی

**ڕازیانـەوە** / ř**az(i)yanewe**/: چـاوگ. ڕازانـــەوە 🇮🇷 آراسته شدن

**ڕازیای** / řaz(i)yay/: ☜ **ڕازان**

**ڕازین**[1] / řazîn/: چـاوگ. ڕازان: ١. هــەڵاژیان ٢. ئامادە بوون 🇮🇷 ١. دراز کشیدن ٢. آماده شدن

**ڕازین**[2]: ☜ **ڕازەن**

• **ڕازێن** / řazên/: پاشەوشە. ڕازێنــەر ‹خـوانڕازێـن؛ کوڕڕازێن› 🇮🇷 ـ آرا

**ڕازێنکار** / řazênkar/: ناو. دیکۆراتور؛ کەسـێ کـە کـاری سـاز کـردن و ڕازاندنـەوەی شـوێنێکە 🇮🇷 دکوراتور

**ڕازێنکـاری** / řazênkarî/: نـاو. دیکۆراسـیون: ١. زانست یـا هونـەری ڕازاندنـەوەی جێگایـەک ٢. کاری ڕازاندنەوەی ناو ماڵ 🇮🇷 ١و٢. دکوراسیون

**ڕازێنـە** / řazêne/: ناو. ١. ئەو شتەی دەبێتە هـۆی ڕازاندنەوە ٢. جوانکـاری وێژەیـی (وەک جینـاس، کینایە و...) 🇮🇷 ١. زینت؛ دکور ٢. آرایەی ادبی

**ڕازێنــەر**[1] / řazêner/: نـاو. ١. ڕازێنکـــار ٢. ئـــەو کەسەی سەر و ڕوو جوان دەکا 🇮🇷 ١. دکوراتـور ٢. آرایشگر

**ڕازێنەر**[2]: ئاوەڵناو. ڕازێنەرەوە؛ ڕازێنــەوە؛ وەڕازێـن؛ جوانکەر 🇮🇷 آراینده؛ زینتبخش

**ڕازێنەرەوە** / řazênerewe/: ☜ **ڕازێنەر**[2]

**ڕازێنەوە** / řazênewe/: ☜ **ڕازێنەر**[2]

**ڕاژ** / řaj/: ☜ **ڕاچە**[1]

**ڕاژان** / řajan/: چـاوگ. ١. ☜ **ڕازان** ٢. هــەژان؛ هەژیان؛ جووڵانەوە بۆ دواوە و پێشــەوە 🇮🇷 ١. ☜ **ڕازان** ٢. حرکت پاندولی

**ڕاژاندن** / řajandin/: چـاوگ. ڕاژاندنەوە؛ ڕاژەنـدن؛ ڕاژەنین؛ ڕاژانن؛ لەراندن؛ شەکاندن؛ بەرەو پێش و پاشەوە بزاوتن (وەک: بێشکە و ...) ‹گۆرانی ئـەوت و خۆی ڕائەژاند› 🇮🇷 پاندولی حرکت دادن

**ڕاژاندنەوە** / řajand(i)newe/: ☜ **ڕاژاندن**

**ڕاژانن** / řajanin/: ☜ **ڕاژاندن**

**ڕاژانە** / řajane/: ☜ **ڕازیانە**

**ڕاژانـەوە** / řajanewe/: چـاوگ. ڕاژیانـەوە؛ بـەرەو پێش و پاش هاتوچۆ کـردن 🇮🇷 پانـدولی حرکـت کردن

**ڕاژاو** / řajaw/: ئاوەڵـناو. هـــەژیای؛ شـــەکاوە 🇮🇷 دراهتزاز

**ڕاژۆ** / řajo/: ناو. حەنەک؛ نوکتە؛ قسـەی خۆشـی بەتێکول 🇮🇷 نُکته

**ڕاژور** / řajor/: نـاو. ١. لاژوور؛ لای بەرز لـە کـۆڕدا ٢. دەسەڵاتدار 🇮🇷 ١. صدر مجلس ٢. حاکم

**ڕاژوور** / řajûr/: ئاوەڵـناو. بـڕیاردەر؛ دەســـەڵاتدار؛ بەدەسەڵات 🇮🇷 حاکم

**ڕاژە** / řaje/: نـاو. ١. ڕاوە؛ شرۆڤــە؛ لێکدانـــەوە؛ شیکردنەوە ٢. خزمەت؛ کاربۆ؛ کارێ کە قازانجی بۆ کەس یان کەسانیترە ‹ڕاژەی دایـک و بـاوک› ٣. ڕاژ؛ تیرەک؛ شاتیر؛ کاریتە ٤. ئالووداری مـیچ 🇮🇷 ١. شرح و تفسیر ٢. خدمت ٣. بالار ۴. الوار سقف

**ڕاژەکـار** / řajekar/: نـاو. شرۆڤـــەکار؛ ڕاڤـــەکار؛ شرۆچی 🇮🇷 مُفسر

**ڕاژەندن** / řajendin/: ☜ **ڕاژاندن**

**ڕاژەنین** / řajenîn/: ☜ **ڕاژاندن**

**ڕاژەوان** / řajewan/: ناو. ١. خزمەتکار؛ نۆکەری ناو ماڵ ٢. ڕاڤەوان؛ شرۆڤەکار 🇮🇷 ١. مُستخدم ٢. مُفسر

**ڕاژەوانـی** / řajewanî/: نـــاو. شرۆڤـــــەکاری 🇮🇷 تفسیرگری

**ڕاژیانەوە** / řajyanewe/: ☜ **ڕاژانەوە**

**ڕاژێر**[1] / řajêr/: ناو. ١. ڕایەخ؛ ئەو شتەی لـە سـەر زەوین پان ئەکرێتــەوە ٢. باشـــوور ٣. لاژێـر؛ لای خواروو 🇮🇷 ١. زیرانداز ٢. جنوب ٣. پایین

**ڕاژێر**[2]: ئاوەڵناو. ژێردەست 🇮🇷 زیردست

**ڕاژێن¹ / řajên/**: ئاوەڵناو. ڕاژێنەر ☰ جُنباننده

**ـ ڕاژێن²**: پاشەوشە. ـ هەژێن ☰ ـ جُنبان

**ڕاژێندراو / řajênd(i)raw/**: ئاوەڵناو. شاندی ☰ جنبانده شده

**ڕاژێنەر / řajêner/**: ئاوەڵناو. هەژێنەر ☰ جُنباننده

**ڕاس¹ / řas/**: ☜ **ڕاست**

▣ **ڕاس بونەوە**: ☜ **ڕاست بونەوە**

**ڕاس ڕۆین**: ☜ **ڕاست ڕۆین**

**ڕاس کردن**: ☜ **ڕاست کردن/ کرن**

**ڕاس وتن**: ☜ **ڕاست کوتن/ گوتن/ وتن/ واتن**

**ڕاسەو بون**: ☜ **ڕاست بونەوە**

**ڕاسەو کردن**: ☜ **ڕاست کردنەوە**

**ڕاس²**: ئاوەڵکار. ڕاست؛ ڕێک ‹ڕاس بچۆ! ڕاس دایە ناو چاویا› ☰ راست؛ مستقیم

**ڕاس ـ³**: پێشوشە. ڕاست ـ ‹ڕاسبێژ› ☰ راست ـ

**ـ ڕاس⁴**: پاشەوشە. ـ ڕاست ‹ دەمڕاس › ☰ ـ راست

**ڕاسا¹ / řasa/**: ناو. ١. درێژایی؛ شان ‹ئەم چەمە وا لە ڕاسای دارەکاندا› ٢. سۆ؛ لا؛ ڕووبە ‹لە ڕاسای سیاسەتەکانی دەولەوتدا› ☰ ١. امتداد ٢. راستا

**ڕاسا²**: ئاوەڵناو. ڕاستا: ١. تەخت؛ بێ بەرز و نزمی ٢. ڕاست؛ بێ‌پێچ و لاری ☰ ١. هموار ٢. مستقیم

**ڕاساڵ / řasał/**: ☜ **ڕاستاڵ**

**ڕاسان / řasan/**: چاوگ. ١. ڕاکۆڵین؛ ڕاکولین؛ دەست بەرز کردنەوە بۆ هەڕەشە (بۆ ڕزگاری) ‹ڕۆژێکی بە مەستی عەرەبێکی پێخواس/ نەیزانی لە لۆکی هەمزە ڕاساوە بە داس «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ٢. ڕاپەڕین؛ ڕابوون (بۆ ڕزگاری) ‹نە تووکی برای ڕێبواری/ لە کاسی خەوا، فێری ڕاسانی ناکەن «سوارە»› ☰ ١. ژستِ زدن به خود گرفتن ٢. قیام کردن

**ڕاسانەوە / řasanewe/**: چاوگ. وەستانەوە؛ هەڵمەت بردن ☰ حمله کردن

**ڕاساو¹ / řasaw/**: ناو. داروو کەیێ سەردادراو بۆ ڕۆشن کردنەوەی شوێنی ئاو لە مەزرادا ☰ قطعه چوبی راست و بلند برای آبیاری

**ڕاساو²**: ئاوەڵناو. ڕاپەڕیو ☰ قیام‌کرده

**ڕاساوە / řasawe/**: ئاوەڵناو. چەل‌وچۆم؛ خۆ گیف کردوو (بۆ شەڕ) ☰ آماده (برای حمله)

**ڕاسایی / řasayî/**: ناو. تەختایی (زەمین) ☰ هموارى (زمين)

**ڕاس‌بینانە / řasbînane/**: ☜ **ڕاست‌بینانە¹**

**ڕاس‌بینی / řasbînî/**: ☜ **ڕاست‌بینی**

**ڕاسپاردن / řas(i)pardin/**: چاوگ. ڕائەسپاردن؛ ڕاسپێران: ١. پێ‌سپاردن؛ قەوینتی کردن ‹ڕامسپارد ئاگایان لێ بێ› ٢. پێ‌سپاردنی کارێک ‹وەزارەت پاسەوانانی ڕاسپارد، هۆشیاری بدەنە خەڵک› ☰ ١. سفارش کردن ٢. مأمور کردن

**ڕاسپاردە¹ / řas(i)parde/**: ناو. ڕائەسپاردە؛ ڕاسپارە؛ ڕاسپێراو: ١. کارگێڕ؛ فەرمانبەر؛ کەسێ کە کارێکی پێ سپێردراوە ‹بەڵێنی ڕاگەیاندی ڕاسپاردە/ گوتی بۆت دێتە بن ئەو پاردە غار دە! «هێمن»› ٢. ئەو شتەی ڕایان‌سپاردووە ‹من ڕاسپاردەی باب و باپیرم/ فەرموودەی ئەوان هەر وا لە بیرم «قانع»› ٣. ☜ **ڕاسپێری** ☰ ١. مأمور ٢. سفارشی ٣. ☜ **ڕاسپێری**

**ڕاسپاردە²**: ئاوەڵناو. ١. ڕائەسپاردە؛ ڕاسپارە؛ ڕاسپێراو ‹ئەم کارە ڕاسپاردەی بابمە› ٢. تایبەت؛ زۆر باش ‹ئەم کەوشانە ڕاسپاردەن، شتی وا لە بازاڕ دەس ناکەوێ› ☰ ١. سفارش شده ٢. سفارشی

**ڕاسپارە / řas(i)pare/**: ☜ **ڕاسپاردە**

**ڕاسپاری / řas(i)parî/**: ناو. ڕاسپێری؛ سفارش ‹ڕووبەڕوویی بێ یا بە ڕاسپاری/ بە نهێنی بێ یا بە سەرزاری «فولکلۆر»› ☰ سفارش

**ڕاسپێر / řas(i)pêr/**: ناو. ١. قەوینتی‌کەر؛ ئەو کەسەی ڕادەسپێرێ ٢. ئەو کەسە ڕادەسپێردرێ ☰ ١. سفارش‌کننده ٢. سفارش‌شده

**ڕاسپێران / ř̄as(i)pêran/:** ☜ **ڕاسپاردن**
**ڕاسپێراو / ras(i)pêraw/:** ☜ **ڕاسپارده**
**ڕاسپێری / ř̄as(i)pêrî/:** ناو. ڕاسپارده؛ قەوینتی؛ کارێ کە ئەدرێ بە فەرمانبەر ☰ مأموريت
**ڕاست[1] / ř̄ast/:** ناو. ڕاس: ١. ئەو لایە کە ئەگەر بەرەو باشوور ڕاوەستین لە ڕۆژاوایە ٢. جۆرێ هەڵپەڕکێ ٣. هەوایەکی گۆرانی ٤. گۆشەیەک لە دەزگای ڕاستپەنجگادا ☰ ١. راست ٢. نوعی رقص ٣. آهنگی است ۴. راست؛ گوشه‌ای در دستگاه راست‌پنجگاه
**ڕاست[2]:** ئاوەڵناو. ڕاس: ١. جێگرتوو لە لای ڕاستەوە ‹دەستی ڕاست› ٢. قیت؛ قنج؛ هەڵستاو ٣. ڕێک؛ بێخێچی و خواری ‹خەتی ڕاست› ٤. دروست؛ ڕێک لەگەڵ ڕاستەقینەدا؛ دژی درۆ ‹هەواڵی ڕاست› ٥. ڕووڕاست؛ بێ‌ڕیا؛ بێ‌درۆ و دووڕوویی ‹ڕاستی ڕەفتی، چەفتی کەفتی!› ٦. تەخت؛ هامار؛ بێ‌بەرز و نزمی ‹زەوی ڕاست› ☰ ١. راست ٢. عمود ٣. راست ۴. صحيح ۵. روراست ۶. هموار
⊡ **ڕاست بوونەوە:** ڕاس بوونەوە؛ ڕاسەو بوون؛ ڕاست وەبوون؛ ڕاستەوە بوون: *[کینایە]* ١. هەڵسان؛ هەڵسیان ٢. هەستانەوە دوای کەوتن ٣. لە نەخۆشی چا بوونەوە ٤. لە خێچ و خواری دەرچوون ☰ ١. برخاستن ٢. برخاستن پس از افتادن ٣. شفا يافتن از بيماری ۴. راست شدن کج
**ڕاست ڕۆین:** *[کینایە]* ڕاس ڕۆین؛ دان بە ڕاستیدا هێنان ‹ڕاست برۆ! درۆ نەکەی!؛ پیاو ڕاست بڕوا، نەمدەزانی وای لێ دێ› ☰ حقيقت را گفتن
**ڕاست کردن/ کرن:** ڕاس کردن: ١. ئاخافتنی بێ‌درۆ ٢. *[کینایە]* لە لاری ڕزگار کردن ٣. *[مەجاز]* تاو کردن؛ ساز کردن و دڵ ساندنی کچ ☰ ١. راست گفتن ٢. کج را راست کردن ٣. به دست آوردن دل دختر
**ڕاست کردنەوە:** ڕاستەوە کردن؛ ڕاسەو کردن: ١. بڵند کردن؛ هەڵستاندن ٢. لە خواری دەرهێنان ٣. *[مەجاز]* دروست کردنی هەڵەوپەڵە ‹هەڵەکانم بۆ ڕاست کەوە!› ☰ ١. بلند کردن ٢. کج را راست نمودن ٣. تصحيح کردن
**ڕاست کوتن/ گوتن/ وتن/ واتن:** ڕاس وتن؛ درۆ نەکردن لە قسەدا ☰ راست گفتن
**ڕاست وەبوون:** ☜ **ڕاست بوونەوە**
**ڕاست ویستن:** دەستەواژەیەکە، واتا: بەڕاستی ‹بە ئاوری دووری ئاخر بوومە قەقنەس/ ئەگەر ڕاستت دەوێ هێز و هەناوم! «شاوات»› ☰ راستش را خواستن
**ڕاستەو/ ڕاستەوە بوون:** ☜ **ڕاست بوونەوە**
**ڕاستەو/ ڕاستەوە کردن:** ☜ **ڕاست کردنەوە**
**ڕاستەو/ ڕاستەوە نەبوون:** بەرەکەت نەکردن؛ وەکوو تووکێک دەگوترێ، واتە: داوەشی، لە کار بکەوی ‹ئەی فەلەک! ڕاستەو نەبی، بۆ ڕێکوپێکی دەورەکەت/ گورگ ئەبێتە شوانی ڕان و دز ئەبێتە ئەولیا! «قانع»› ☰ نفرينی است
**لێ ڕاست بوونەوە:** بەرهەڵەست بوونەوە ‹کابرایەکم لێ ڕاست بۆتەوە بە هیچ شێوەیەک بۆم حالی نابێ!› ☰ به مُقابله برخاستن
**ڕاست[3]:** ئاوەڵکار. ڕێک؛ یەکڕاست ‹ڕاست چووە ژوورەوە و دانیشت!› ☰ درست؛ مستقيم
**ڕاستا / ř̄asta/:** ☜ **ڕاسا[2]**
**ڕاستاڤەکری / ř̄astavek(i)rî/:** ئاوەڵناو. ڕاستکراوە؛ ئاشکراکراو ☰ آشکارشده
**ڕاستاڵ / ř̄astał/:** ئاوەڵناو. ڕاساڵ؛ جێ‌بڕوا ☰ مورد اعتماد
**ڕاستان / ř̄astan/:** ناو. ١. ڕاستایی؛ تەختایی؛ دەشت؛ زەمینی ڕێک ‹ڕاستانێکە تا چاو کار ئەکا تەختە› ٢. چاکان؛ کەسانی ڕاستبێژ و دروستکار ‹قیبلەگای حاجەت کەعبەی ڕاستان/ تووتیائاسا،

خاک ئاستان «مەلا حەسەنی دزلی» ١. هەمواری زەمین ٢. پاکان

**ڕاستاندن / řastandin/**: چاوگ. ڕاست کردنـەوەی خوار راست کردن کجی

**ڕاستانە / řastane/**: ئاوەڵکار. لـە ڕاسـتیدا؛ لـە ڕاستەقینەدا حقیقتاً

**ڕاستاوێژ / řastawêj/**: ناو. جوانەگایێ کـە لەگـەڵ گایەک بە ئامووری بێگاسن جووتی پێ دەکـەن تا ڕا بێ و بۆ بەهاری سالی داهاتوو جووت بکا گوسالەای کە شخم زدن بیاموزد

**ڕاستاهەڤ / řastahev/**: ئاوەڵناو. بەرامبەر؛ هەمبەر؛ هاوسەنگ برابر

**ڕاستایی / řastayî/**: ناو. ١. تـەختایی؛ دەشـت؛ زەمـینی تـەخت ٢. بەرانبـەر؛ ڕووبـەڕوو ٣. لای ڕاست ١. زمین هموار ٢. طـرف مقابـل ٣. طـرف راست

**ڕاستبڕاست / řastb(i)řast/**: ئاوەڵکار. ڕاستەوڕاست؛ بەپانەوە؛ بە ڕاشکاوی صریح؛ بی‌رودربایسی

**ڕاستبین / řastbîn/**: ئاوەڵناو. بیرڕاست؛ دڵباش راستبین

**ڕاستبینانە[1] / řastbînane/**: ئاوەڵناو. ڕاسبینانـە؛ دروسـت و ڕاسـت ‹بـڕیاری ڕاسـتبینانـە› راستبینانه

**ڕاستبینانە[2]**: ئاوەڵکار. بـە ڕاسـت بینیـەوە ‹ڕاستبینانە بڕیاری دا› راستبینانه

**ڕاستبینی / řastbînî/**: نـاو. ڕاسبـینی؛ ڕەوتی گرنگی دان و سەرنج دان بە ڕاستی خۆ پاراستن لە خەیالی خاو راستبینی

**ڕاستبێژ / řastbêj/**: ئاوەڵناو. ڕاسوێژ؛ ڕاسـتوێـژ؛ ڕاستدەر؛ ڕاستڕۆ؛ ڕاستڕەو؛ ڕاستگۆ؛ ڕاستۆک؛ قسەڕاست؛ دوور لە فشە و درۆ راستگو

**ڕاستبێژی / řastbêjî/**: ناو. ڕاستگۆیی؛ قسەڕاستی راستگویی

**ڕاستخواز / řastx(i)waz/**: ئاوەڵناو. دادگـەر؛ دادپەروەر؛ دادپرس؛ خـاوەن کـردەوەی گونجـاو بەرامبەر بە داد و قانوون عادل

**ڕاستدەر / řastder/**: ئاوەڵناو. ١. ڕاسـتوێـژ؛ ڕاسـتڕەو؛ قسەڕاسـت؛ بـێ فشـە و درۆ ٢. ڕاستنەبێژ؛ درۆزن ١. راستگو ٢. دروغگو

**ڕاستدەست / řastdest/**: ئاوەڵناو. ڕاسدەس؛ ڕاستدەست: ١. ڕاستەوانە؛ تواناتر و خووگرتووی کارکردن بە دەستی ڕاست ٢. دەسژێر؛ خاوەن دەسـتی بـەکار بـۆ کـاری ورد و ڕێـک ١. راستدست ٢. دستماهر

**ڕاستدەمی / řastdemî/**: ناو. تەکووزی؛ ڕێکوپێکی نظم

**ڕاستڕاوەستاو / řastřawestaw/**: ئاوەڵناو. قیـت؛ قنج؛ بڵند و ڕاست راست؛ قائم

**ڕاستڕۆ / řastřo/**: ☜ **ڕاستبێژ**

**ڕاستڕەو / řastřew/**: ☜ **ڕاستبێژ**

**ڕاستزاڵی / řastzałî/**: ناو. بار و دۆخـێ کـە لای ڕاستی لەش لە لای چەپ بەهێزتر بێ. بەرانبەر: **چەپزاڵی** راستبرتری

**ڕاستک / řastik/**: ناو. ١. تـەختی و ڕاسـتایی ٢. خەتی نێوان قژە سەر ١. همواری ٢. خـط فـرق سر

**ڕاستکار / řastkar/**: ئاوەڵناو. بـێگـزی و دزی؛ بێلاری و خواری درستکار

**ڕاستکراوە / řastk(i)rawe/**: ☜ **ڕاستاڤەکری**

**ڕاستکەتی / řastketî/**: ئاوەڵناو. شیاو سزاوار

**ڕاستکەر / řastker/**: ناو. *[بلار]* ڕاکەر؛ دەلالی نێوان کچ و کوڕ دلال محبت

**ڕاستکەرەوە / řastkerewe/**: ناو. ١. کەسـێ کـە خـوار ڕاسـت دەکاتـەوە ٢. هەڵـەبژار؛ هەڵـەی نووسراو لابەر ١. راستکننده ٢. نمونه‌خوان

**ڕاستگۆ / řastgo/**: ☜ **ڕاستبێژ**

**ڕاسپێران / ras(i)pêran/:** ☜ **ڕاسپاردن**

**ڕاسپێراو / ras(i)pêraw/:** ☜ **ڕاسپاردە**

**ڕاسپێری / ras(i)pêrî/:** ناو. ڕاسپاردە؛ قەوینتی؛ کارێ کە ئەدرێ بە فەرمانبەر ☳ مأموریت

**ڕاست[1] / rast/:** ناو. ڕاس: ۱. ئەو لایە کە ئەگەر بەرەو باشوور ڕاوەستین لە ڕۆژاوایە ۲. جۆرێ هەڵپەڕکێ ۳. هەوایەکی گۆرانی ٤. گۆشەیەک لە دەزگای ڕاستپەنجگادا ☳ ۱. راست ۲. نوعی رقص ۳. آهنگی است ۴. راست؛ گوشه‌ای در دستگاه راست‌پنجگاه

**ڕاست[2]:** ئاوەڵناو. ڕاس: ۱. جێگرتوو لە لای ڕاستەوە ‹دەستی ڕاست› ۲. قیت؛ قنج؛ هەڵستاو ۳. ڕێک؛ بێخێچی و خواری ‹خەتی ڕاست› ٤. دروست؛ ڕێک لەگەڵ ڕاستەقینەدا؛ دژی درۆ ‹هەواڵی ڕاست› ٥. ڕووڕاست؛ بێڕیا؛ بێدرۆ و دووڕوویی ‹ڕاستی ڕەفتی، چەفتی کەفتی!› ٦. تەخت؛ هامار؛ بێبەرز و نزمی ‹زەوی ڕاست› ☳ ۱. راست ۲. عمود ۳. راست ۴. صحیح ۵. روراست ۶. هموار

▣ **ڕاست بوونەوە:** ڕاس بوونەوە؛ ڕاسەو بوون؛ ڕاست وەبوون؛ ڕاستەوە بوون: *[کنایە]* ۱. هەڵسان؛ هەڵسیان ۲. هەستانەوە دوای کەوتن ۳. لە نەخۆشی چا بوونەوە ٤. لە خێچ و خواری دەرچوون ☳ ۱. برخاستن ۲. برخاستن پس از افتادن ۳. شفا یافتن از بیماری ۴. راست شدن کج

**ڕاست ڕۆین:** *[کنایە]* ڕاس ڕۆین؛ دان بە ڕاستیدا هێنان ‹ڕاست برۆ! درۆ نەکەی!؛ پیاو ڕاست بڕوا، نەمدەزانی وای لێ دێ› ☳ حقیقت را گفتن

**ڕاست کردن/ کرن:** ڕاس کردن: ۱. ئاخافتنی بێدرۆ ۲. *[کنایە]* لە لاری ڕزگار کردن ۳. *[مجاز]* تاو کردن؛ ساز کردن و دڵ ساندنی کچ ☳ ۱. راست گفتن ۲. کج را راست کردن ۳. بە دست آوردن دل دختر

**ڕاست کردنەوە:** ڕاستەوە کردن؛ ڕاسەو کردن: ۱. بڵند کردن؛ هەڵستاندن ۲. لە خواری دەرهێنان ۳. *[مجاز]* دروست کردنی هەڵەویەڵە ‹هەڵەکانم بۆ ڕاست کەوە!› ☳ ۱. بلند کردن ۲. کج را راست نمودن ۳. تصحیح کردن

**ڕاست کوتن/ گوتن/ وتن/ واتن:** ڕاس وتن؛ درۆ نەکردن لە قسەدا ☳ راست گفتن

**ڕاست وەبوون:** ☜ **ڕاست بوونەوە**

**ڕاست ویستن:** دەستەواژەیەکە، واتا: بەڕاستی ‹بە ئاوری دووری ئاخر بوومە قەقنەس/ ئەگەر ڕاستت دەوێ هێز و هەناوم! «ئاوات»› ☳ راستش را خواستن

**ڕاستەو/ ڕاستەوە بوون:** ☜ **ڕاست بوونەوە**

**ڕاستەو/ ڕاستەوە کردن:** ☜ **ڕاست کردنەوە**

**ڕاستەو/ ڕاستەوە نەبوون:** بەرەکەت نەکردن؛ وەکوو تووکێک دەگوترێ، واتە: داوەشی، لە کار بکەوی ‹ئەی فەلەک! ڕاستەو نەبی، بۆ ڕێکوپێکی دەورەکەت/ گورگ ئەبێتە شوانی ڕان و دز ئەبێتە ئەولیا! «قانع»› ☳ نفرینی است

**لێ ڕاست بوونەوە:** بەرهەڵەست بوونەوە ‹کابرایەکم لێ ڕاست بۆتەوە بە هیچ شێوەیەک بۆم حاڵی نابێ!› ☳ به مُقابله برخاستن

**ڕاست[3]:** ئاوەڵکار. ڕێک؛ یەکڕاست ‹ڕاست چووە ژوورەوە و دانیشت!› ☳ درست؛ مستقیم

**ڕاستا / rasta/:** ☜ **ڕاسا[2]**

**ڕاستاڤەکری / rastavek(i)rî/:** ئاوەڵناو. ڕاستکراوە؛ ئاشکراکراو ☳ آشکارشده

**ڕاستاڵ / rastal/:** ئاوەڵناو. ڕاساڵ؛ جێبڕوا ☳ مورد اعتماد

**ڕاستان / rastan/:** ناو. ۱. ڕاستایی؛ تەختایی؛ دەشت؛ زەمینی ڕێک ‹ڕاستانێکە تا چاو کار ئەکا تەختە› ۲. چاکان؛ کەسانی ڕاستبێژ و دروستکار ‹قیبلەگای حاجەت کەعبەی ڕاستان/ تووتیائاسا،

خاک ئاستان «مەلا حەسەنی دزلی» ≡ ١. هموارى زمین ٢. پاکان

**ڕاستاندن / řastandin/**: چاوگ. ڕاست کردنـەوەی خوار ≡ راست کردن کجی

**ڕاستانە / řastane/**: ئاوەڵکار. لـە ڕاسـتیدا؛ لـە ڕاستەقینەدا ≡ حقیقتاً

**ڕاستاوێژ / řastawêj/**: ناو. جوانەگایێ کـە لەگـەڵ گایەک بە ئامووری بێگاسن جووتی پێ دەکـەن تا ڕا بێ و بۆ بەهاری سالی داهاتوو جووت بکا ≡ گوسالەای کە شخم زدن بیاموزد

**ڕاستاهەڤ / řastahev/**: ئاوەڵناو. بەرامبەر؛ هەمبەر؛ هاوسەنگ ≡ برابر

**ڕاستایی / řastayî/**: ناو. ١. تـەختایی؛ دەشـت؛ زەمـینی تـەخت ٢. بەرانبـەر؛ ڕووبـەڕوو ٣. لای ڕاست ≡ ١. زمین هموار ٢. طـرف مقابـل ٣. طـرف راست

**ڕاستبڕاست / řastb(i)řast/**: ئاوەڵکار. ڕاستەوڕاست؛ بەپانەوە؛ بە ڕاشکاوی ≡ صریح؛ بی‌رودربایسی

**ڕاستبین / řastbîn/**: ئاوەڵناو. بیرڕاست؛ دڵباش ≡ راستبین

**ڕاستبینانە[1] / řastbînane/**: ئاوەڵناو. ڕاسبینانـە؛ دروسـت و ڕاسـت ‹بـڕیاری ڕاسـتبینانـە› ≡ راستبینانه

**ڕاستبینانە[2]**: ئاوەڵکار. بـە ڕاسـت بینیـەوە ‹ڕاستبینانە بڕیاری دا› ≡ راستبینانه

**ڕاستبینی / řastbînî/**: نـاو. ڕاسبـینی؛ ڕەوتی گرنگی دان و سەرنج دان بە ڕاستی خۆ پاراسـتن لە خەیالی خاو ≡ راستبینی

**ڕاستبێژ / řastbêj/**: ئاوەڵناو. ڕاسوێژ؛ ڕاسـتوێـژ؛ ڕاستدەر؛ ڕاستڕۆ؛ ڕاستڕەو؛ ڕاستگۆ؛ ڕاستۆک؛ قسەڕاست؛ دوور لە فشە و درۆ ≡ راستگو

**ڕاستبێژی / řastbêjî/**: ناو. ڕاستگۆیی؛ قسەڕاستی ≡ راستگویی

**ڕاستخواز / řastx(i)waz/**: ئاوەڵناو. دادگـەر؛ دادپەروەر؛ دادپرس؛ خـاوەن کـردەوەی گونجـاو بەرامبەر بە داد و قانوون ≡ عادل

**ڕاستدەر / řastder/**: ئاوەڵناو. ١. ڕاسـتوێـژ؛ ڕاسـتڕەو؛ قسەڕاسـت؛ بـێ فشـە و درۆ ٢. ڕاستنەبێژ؛ درۆزن ≡ ١. راستگو ٢. دروغگو

**ڕاستدەست / řastdest/**: ئاوەڵناو. ڕاسدەس؛ ڕاستدەست: ١. ڕاستەوانە؛ تواناتر و خووگرتووی کارکردن بە دەستی ڕاست ٢. دەسڕێژ؛ خـاوەن دەسـتی بـەکار بـۆ کـاری ورد و ڕێـک ≡ ١. راست‌دست ٢. دست‌ماهر

**ڕاستدەمی / řastdemî/**: ناو. تەکووزی؛ ڕێکوپێکی ≡ نظم

**ڕاستڕاوەستاو / řastřawestaw/**: ئاوەڵناو. قیـت؛ قنج؛ بلند و ڕاست ≡ راست؛ قائم

**ڕاستڕۆ / řastřo/**: ☜ ڕاستبێژ

**ڕاستڕەو / řastřew/**: ☜ ڕاستبێژ

**ڕاستزاڵی / řastzałî/**: ناو. بـار و دۆخـێ کـە لای ڕاستی لەش لە لای چەپ بەهێزتر بێ. بەرانبەر: **چەپزاڵی** ≡ راستبرتری

**ڕاستک / řastik/**: ناو. ١. تـەختی و ڕاسـتایی ٢. خەتی نێوان قژە سەر ≡ ١. همواری ٢. خـط فـرق سر

**ڕاستکار / řastkar/**: ئاوەڵناو. بـێگـزی و دزی؛ بێلاری و خواری ≡ درستکار

**ڕاستکراوە / řastk(i)rawe/**: ☜ **ڕاستاڤەکری**

**ڕاستکەتی / řastketî/**: ئاوەڵناو. شیاو ≡ سزاوار

**ڕاستکەر / řastker/**: ناو. *[پلار]* ڕاکەر؛ دەلالی نێوان کچ و کوڕ ≡ دلال محبت

**ڕاستکەرەوە / řastkerewe/**: ناو. ١. کەسێ کـە خـوار ڕاسـت دەکاتـەوە ٢. هەڵـەبژار؛ هەڵـەی نووسراو لابەر ≡ ١. راست‌کننده ٢. نمونه‌خوان

**ڕاستگۆ / řastgo/**: ☜ ڕاستبێژ

**ڕاستگۆیی** / řastgoyî/: ☜ **ڕاستبێژی**

**ڕاستوچەپ** / řast û çep/: ناو. ١. ئامرازێکە شیشەی لە تفەنگا گیربووی پێ دەردەهێننەوە ٢. کاری تێکپەڕاندنی پەلی ڕاستە و چۆپە لە چارە کردنی پشت وەرگەڕاندا ■ ١. ابزار بیرون آوردن سیخ گیرکردە در لولەی تفنگ ٢. عمل دست راست و پای چپ یا بالعکس را کشیدن برای معالجە

**ڕاستودرێژ** / řast û d(i)rêj/: ئاوەڵکار. ڕاستەوڕاست؛ بە باری درێژایی و یەک لە شوێن یەکدا ‹خشتەکانیان ڕاستودرێژ داناوە› ■ راستە چین

**ڕاستوڕەوان** / řast û řewan/: ئاوەڵناو. بێپەردە و مینگەمینگ ■ رُک و صریح

**ڕاستوێژ** / řastwêj/: ☜ **ڕاستبێژ**

**ڕاستۆ**[1] / řasto/: ئاوەڵناو. ١. ڕاستگۆ ٢. بە بێ مەرایی ■ ١. راستگو ٢. بی‌ریا

**ڕاستۆ**[2]: ئاوەڵکار. ڕاست و ڕەوان ■ بی‌پردە

**ڕاستۆخ** / řastox/: ئاوەڵناو. حەقبێژ؛ ڕاستبێژ ■ حقگو

**ڕاستۆک** / řastok/: ئاوەڵناو. ڕاستبێژ؛ بێدرۆ ■ راستگو

**ڕاستە** / řaste/: ناو. ڕاسە: ١. خەتکێش ٢. دارێکی دوو لک بۆ ئەزموونی ڕاستی و خواری بەرداش ٣. قەیسەری؛ گوزەر؛ بازاڕی سەرداپۆشراو ‹ڕاستەی زێڕینگەران› ٤. ڕاست؛ جۆرێ هەڵپەڕکێ ٥. کۆڵان یان ڕێبازی ڕاست و بێپێچ و پەنا ٦. گۆشتی پشت مازە ٧. *[زیناسی]* یەکەیەکی ڕیزبەندی گیانەوەران، بریتی لە چەن تیرە ■ ١. خط‌کش ٢. چوبی دوشاخە برای اندازەگیری در آسیا ٣. راستە بازار؛ تیمچە ۴. نوعی رقص ۵. راستە ۶. گوشت راستە ٧. راستەی زیستی

**ڕاستەبازار** / řastebazar/: ئاوەڵناو. چوارسوو ■ راستە بازار

**ڕاستەبازاڕ** / řastebazař/: ناو. قەیسەری؛ گوزەر ■ راستەبازار

**ڕاستەپێ** / řastepê/: ئاوەڵکار. قرچەپێ؛ بەلەز لە بەر پێی کەسێ یان بە بۆنەیەکەوە هەستان ‹هەموو ڕاستەپێ بۆ سروودی نیشتمانی هەستان› ■ جُفت‌پا

**ڕاستەخۆ** / řastexo/: ئاوەڵکار. ڕاستەوخۆ: ١. ڕاستەوڕاست؛ ڕاستەوڕێ؛ یەکڕاست ‹ڕاستەخۆ بۆ سەر و هەر بۆ سەر چوو/ هەردی جێهێشت و لە هەوران دەرچوو «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ٢. زیندوو؛ تایبەتمەندی بەرنامەی ڕادیۆیی یان تەلەڤیزیونی کە هەر لەو کاتەدا بەڕێوە دەچێ بڵاو ببێتەوە ‹پەخشی ڕاستەخۆی فووتباڵ› ٣. بە ڕاشکاوی و بێ مینگەمینگ ‹مینگەمینگی ناوێ، ڕاستەخۆ پێی بێژە!› ■ ١. مستقیم ٢. زندە ٣. صریح

**ڕاستەڕێ** / řasteřê/: ناو. ڕێگەی بێپێچ ‹لە ڕاستەڕێ شارەزان کە! ڕێ ئەوانەی کە خۆت چاکەت دەگەڵ کردوون «هەژار، *قورئان*»› ■ راە راست

**ڕاستەقانی** / řasteqanî/: ☜ **ڕاستەقینە**

**ڕاستەقینە**[1] / řasteqîne/: ناو. ڕاستەقانی؛ ڕاستەکی؛ ڕاستەکینە؛ ڕاسەقانی؛ ڕاستینە؛ ڕاسینە؛ ڕاسی ـ ڕاسی؛ ئەوەی هاوڕێی ڕاستی و دروستییە ‹ڕاستەقینە کامەیە؟› ■ حقیقت

**ڕاستەقینە**[2]: ئاوەڵناو. ڕاستەقانی؛ ڕاستەکی؛ ڕاستەکینە؛ ڕاسەقانی؛ ڕاستینە؛ ڕاسینکە؛ ڕاسینە؛ ڕاسی ـ ڕاسی؛ بێ هەڵەوپەڵە ‹ڕێگای ڕاستەقینەی ئازادی و بەرامبەری› ■ صحیح

**ڕاستەک** / řastek/: ناو. ڕاستەی ئاش ■ وسیلەی آزمودن سنگ آسیاب

**ڕاستەکەوان** / řastekewan/: ناو. دوو هێڵی سەرچەماوە ڕووبەڕووی یەکترین کە لە نووسیندا بە کار دەبرێت بە بیچمی: [ ] ■ کروشە

**ڕاستەکی** / řastekî/: ☜ **ڕاستەقینە**

**ڕاستەکینە** / řastekîne/: ☜ **ڕاستەقینە**

**ڕاستەوانە**[1] / řastewane/: ئاوەڵناو. ١. دروست دەرهاتوو ٢. ڕاستدەست؛ ڕاسدەس؛ ڕاسلەر؛ ڕاسیل؛ ڕاستە؛ تواناتر و خووگرتووی کارکردن بە دەستی ڕاست ٣. ☜ **ڕاستەوخۆ**[1]**-١** ☰ ١. راست ٢. راستدست ٣. ☜ **ڕاستەوخۆ**[1]**-١**

**ڕاستەوانە**[2]: ئاوەڵکار. دروست؛ دژی چەپەوانە ‹کەوشەکەت ڕاستەوانە لە پێ کە!› ☰ درست

**ڕاستەوچۆپە** / řastewçope/: ناو. ١. لای ڕاست و لای چەپ ٢. جۆرێ هەڵووکێن ☰ ١. طرف راست و چپ ٢. از بازی‌ها

**ڕاستەوخۆ**[1] / řastewxo/: ئاوەڵناو. ڕاستەوڕاست؛ ڕاستەوڕێ: ١. ڕاستەوانە؛ بێ لادان و لە ڕێ دەرچوون ‹وتووێژی ڕاستەوخۆی لایەنەکان› ٢. زیندوو؛ تایبەتمەندی بەرنامەی ڕادیۆیی یان تەلەڤیزیونی کە هەر لەو کاتەدا بەڕێوە دەچێ بلاو ببێتەوە ‹پەخشی ڕاستەوخۆی فووتباڵ› ٣. بە ڕاشکاوی و بێ مینگەمینگ ☰ ١. مستقیم ٢. زنده ٣. رُک و راست

**ڕاستەوخۆ**[2]: ☜ **ڕاستەخۆ**

**ڕاستەوڕاست** / řastewřast/: ☜ **ڕاستەوخۆ**

**ڕاستەوڕێ** / řastewřê/: ☜ **ڕاستەوخۆ**

**ڕاستەوکراو** / řastewk(i)raw/: ئاوەڵناو. هەڵدراو؛ بەرپا ☰ برپا شده

**ڕاستی**[1] / řastî/: ناو. ڕاسی: ١. ڕێکی؛ بێ لاریوخواری؛ دۆخی قیت و ڕاوەستاو بوون ٢. دروستی؛ ڕاستەقینە؛ ڕاستەقانی ٣. ڕووڕاستی؛ بێ‌ڕیایی ☰ ١. راستی ٢. واقعیت ٣. روراستی

**ڕاستی**[2]: ئاوەڵکار. ڕاسی؛ ڕاسی - ڕاسی؛ بە ڕاستی ‹ڕاستی جوانە!› ☰ راستی؛ واقعاً

**ڕاستی**[3]: ئامراز. ڕاسی؛ بە ڕاست؛ وە ڕاس؛ ئەرێ؛ وشەیەکە بۆ سەرنج ڕاکێشانی بیسەر کە لە نێو قسە و لە سەرەتای قسەدا دێت ‹ڕاستی نەتگوت کەی هاتووی› ☰ راستی

**ڕاستینە** / řastîne/: ☜ **ڕاستەقینە**

**ڕاستیوازی** / řastîwazî/: ناو. ڕیئالیسم: ١. ئۆگرەتی و سەرنج بەرەو ئەوەی ڕووی‌داوە یان ڕێ تێدەچێ ڕوو بدا و خۆ پاراستن لە خەیاڵی خاو ٢. ئامۆژەیێ کە دنیا بە بوونەوەرێکی ڕاستەکی و لە دەرەوەی ئاوەزی مرۆڤ دەزانێ ٣. بڕوا بەوەی کە هەر چی مرۆڤ لێی تێ‌بگا، بوونی هەیە و ڕاستەکییە ٤. ئەمەگداری بە سروشت و ژیانی ڕاستەکی و پارێز لە خەیالات ☰ ١تا٤. واقعگرایی

**ڕاسدەس** / řasdes/: ☜ **ڕاستدەست**

**ڕاسدەست** / řasdest/: ☜ **ڕاستدەست**

**ڕاسگەڕ** / řasgeř/: ☜ **ڕاسگێڵ**

**ڕاسگێڵ** / řasgêł/: ئاوەڵناو. ڕاسگەڕ؛ بەتایبەتمەندی گەڕان بە لای ڕاستدا ☰ راستگرد

**ڕاسلەر** / řasler/: ☜ **ڕاستەوانە**[1]**-٢**

**ڕاسوێژ** / řaswêj/: ☜ **ڕاستبێژ**

**ڕاسوێژی** / řaswêjî/: ☜ **ڕاستبێژی**

**ڕاسۆ** / řaso/: ☜ **ڕاسوو**

**ڕاسوو** / řasû/: ناو. ڕاسۆ؛ ڕاسوولک؛ گەنکەدەڵەک؛ گیانەوەرێکی گوهانداری گۆشتخۆری پەنجەدارە بە جەستەی درێژ، پێی کورت و پێستی تووکنەوە کە لە کاتی بەرەنگار بوونەوەدا بۆنێکی ناخۆش لە خۆی بەر دەداتەوە ☰ راسو

**ڕاسوولک** / řasûlik/: ☜ **ڕاسوو**

**ڕاسە** / řase/: ☜ **ڕاستە**

**ڕاسەر** / řaser/: ناو. لای ژووروو؛ دژی ڕاژێر ☰ سمت بالا

**ڕاسەری** / řaserî/: ناو. لای سەرەوە ☰ طرف بالا

**ڕاسەقانی** / řaseqanî/: ☜ **ڕاستەقینە**

**ڕاسی** / řasî/: ☜ **ڕاستی**

**ڕاسی ـ ڕاسی** / řasî řasî/: ☜ **ڕاستەقینە**

**ڕاسیل** / řasîl/: ☜ **ڕاستەوانە[١]ــ٢**

**ڕاسینکە** / řasînke/: ☜ **ڕاستەقینە[٢]**

**ڕاسینە** / řasîne/: ☜ **ڕاستەقینە**

**ڕاش** / řaş/: ناو. دارێکی بەرز، بە توێکڵەی لووس و خۆڵەمێشی، گەڵای بێددانە یان کەمددانە، گوڵی هێشوویی کورت و کڵۆ و بەری دڕکاوییەوە ☰ درخت راش

**ڕاشکان** / řaş(i)kan/: چاوگ. ١. تێپەڕین ‹شەو ڕاشکا/ ئەژنۆم شل بوو/ مانگی بە تاقی ئاسمانەوە هەڵپڕووکا/ دەرگەکەتم لێ بکەوە! «پەشێو»› ٢. شەق بوون ‹لەبەر شیرینی ڕاشکاوە› ☰ ١. گذشتن؛ سپری شدن ٢. شقّه شدن؛ شکافتن

**ڕاشکاندن** / řaş(i)kandin/: چاوگ. تێپەڕاندن ‹شەوم ڕاشکاند› ☰ گذراندن

**ڕاشکاو** / řaş(i)kaw/: ناوەڵناو. ئاشکرا؛ بێ پێچوپەنا ☰ صریح؛ آشکار

**ڕاشکاوانە[١]** / řaş(i)kawane/: ناوەڵناو. سفتوسادە؛ سووربەسوور؛ ڕەپ‌وڕەوان ‹خەیانەتی ڕاشکاوانە› ☰ رُک و صریح

**ڕاشکاوانە[٢]**: ناوەڵکار. بە ڕاشکاوی ‹ڕاشکاوانە درۆ دەکەن و گوێ نادەن!› ☰ آشکارا

**ڕاشکاوی** / řaş(i)kawî/: ناو. ئاشکرایی ☰ صراحت؛ آشکاری

**ڕاشڵکان** / řaşilkan/: چاوگ. بە شەلەشەل ڕۆیشتن ☰ لنگ‌لنگان راه رفتن؛ لنگیدن

**ڕاشڵەقان** / řaş(i)łeqan/: چاوگ. شڵەقیان؛ بزاوتنی تراو لە دەفر ☰ بە هم خوردن مایع در ظرف

**ڕاشڵەقاندن** / řaş(i)łeqandin/: چاوگ. بزاوندن و ڕاتڵەکاندنی تراو لە دەفردا ☰ به هم زدن مایع در ظرف

**ڕاش‌وڕووت** / řaş û řût/: ☜ **ڕووت‌وڕەجاڵ**

**ڕاشەکان** / řaşekan/: ☜ **ڕاتڵەکان ــ١**

**ڕاشەکاندن** / řaşekandin/: ☜ **ڕاتەکاندن**

**ڕاشەن** / řaşen/: ناو. تێشوو؛ تۆشە؛ توێشووی ڕێگە ☰ توشه؛ زادراه

**ڕاشی** / řaşî/: ناو. ڕۆنی کونجی ☰ روغن کنجد

**ڕاشیتیسم** / řaşîtîsm/: ناو. پێشەنەرمی؛ ئێسکنەرمی؛ نەخۆشی نەرم و خوار بوونەوەی ئێسکی لەش، بەتایبەت لاق، بە هۆی کەمی ڤیتامین «دێ» یان کالسیوم و فوسفۆڕەوە ☰ راشیتیسم

**ڕاشین** / řaşîn/: ناو. ڕێگای پڕ گژ و گیا ☰ راه سبز

**ڕاغ** / řağ/: ناو. بەردەلان؛ ڕێخەلان ☰ سنگلاخ

**ڕاڤڕان** / řaf(i)řan/: ☜ **ڕاڕفان**

**ڕاڤڕاندن** / řaf(i)řandin/: ☜ **ڕاڕفان**

**ڕاڤڕیای** / řafiřyay/: ناوەڵناو. ڕفێنراو ☰ ربوده‌شده

**ڕاڤڕین** / řaf(i)řîn/: ☜ **ڕاڕفان**

**ڕاڤڕێن** / řaf(i)řên/: ☜ **ڕاڕفێن**

**ڕاڤزی** / řaf(i)zî/: ناوەڵناو. بێبەڵێن؛ بێوەفا؛ پەیمانشکێن ☰ پیمان‌شکن

**ڕافە** / řafe/: ناو. چارەنووس؛ ئەو کەسە دەبێتە هۆی ئاشنا بوونی دوو بنەماڵە بۆ زەماوەندی کوڕ و کچیان ☰ کسی که موجب آشنایی دو خانواده جهت ازدواج فرزندانشان می‌شود

**ڕافیسک** / řafîsk/: ناو. ڕەفیسکە؛ سیرمەئاسای دووسەری ماسوولکە کە بە ئێسکەوە دەلکێ ☰ تاندون

**ڕاڤ** / řav/: ناو. ١. ڕاو؛ شکار؛ شژ ٢. پەڵەی ڕەش لە پێست ٣. ماڵە؛ پەڵەی دەم و چاوی ژنی زگپڕ ٤. ڕیز؛ سەف ٥. شەرم و حەیا ٦. بەڵەک ئەستوور بوونی ژنی زگپڕ ☰ ١. شکار ٢. لکه‌های سیاه بر پوست ٣. لکه‌های صورت زن حامله ٤. صف؛ ردیف ۵. حیا ۶. ورم پای زن حامله

**ڕاڤڕۆ** / řavřo/: ناو. کەسێ کە هەمیشە دەچێتە ڕاو ☰ شکارچی حرفه‌ای

**ڕاڤڕووت / řavřût/**: ناو. ڕاوەڕووت؛ جەردەیی ☲ راهزنی
**ڕاڤکار / řavkar/**: ناو. ڕاوچی ☲ شکارچی
**ڕاڤگە / řavge/**: ☜ **ڕاوگە**
**ڕاڤوڕۆ / řav û řo/**: ناو. کار و ڕەوتی گەڕان لە شوێن شتێک ☲ جستجو
**ڕاڤە / řave/**: ناو. شرۆڤە؛ ڕاژە؛ ڕاوە؛ کاری واتا شی کردنەوە ☲ شرح و تفسیر
◘ **ڕاڤە کرن**: شرۆڤە کردن؛ شی کردنەوەی واتا ☲ شرح کردن
**ڕاڤەتان / řavetan/**: چاوگ. لێک‌هەڵبڕان ☲ جدایی افتادن
**ڕاڤەتاندن / řavetandin/**: چاوگ. لێک‌هەڵبڕین ☲ جدایی انداختن
**ڕاڤەر / řaver/**: ناو. کار و ڕەوتی پاڕانەوە؛ لالانەوە ☲ عجز و لابه
**ڕاڤەراندن / řaverandin/**: چاوگ. لالانەوە؛ پاڕانەوە ☲ لابه کردن
**ڕاڤەڤان / řavevan/**: ☜ **ڕاوچی**
**ڕاڤەک / řavek/**: ☜ **ڕاوك**
**ڕاڤەکار / řavekar/**: ناو. ڕاڤەکەر؛ کەسێ کە واتای وتە و نووسراوەیەک شی دەکاتەوە ☲ مُفسر؛ شارح
**ڕاڤەکری / řavek(i)rî/**: ناوەلناو. شی‌کراو؛ شەرح دراو ☲ شرح شده
**ڕاڤەکەر / řaveker/**: ☜ **ڕاڤەکار**
**ڕاڤەنان / řavenan/**: چاوگ. ١. دارانەوە؛ کەوتن (درەخت و ...) ٢. هەڵکەنران؛ لە شوێنی خۆ نەمان ٣. ڕاونان؛ دەرکردن ☲ ١. افتادن (درخت و ...) ٢. کنده شدن ٣. تاراندن
**ڕاڤەناندن / řavenandin/**: چاوگ. ١. داراندنەوە ٢. هەڵکەندن؛ لە شوێنی خۆ نەهێشتن ☲ ١. انداختن ٢. برکندن
**ڕاڤەوان / řavewan/**: ناو. ڕاژەوان؛ ڕاڤەکار؛ شرۆڤەکار ☲ مُفسر
**ڕاڤیار / řavyar/**: ☜ **ڕاوچی**
**ڕاقوت / řaqut/**: ناو. ڕێگر؛ چەتە ☲ رهزن
**ڕاقوتان / řaqutan/**: چاوگ. ١. پەلامار دان ٢. چوونە ناو ٣. ڕاتەکان ☲ ١. یورش بردن ٢. وارد شدن ٣. تکان خوردن
**ڕاقوڵپاندن / řaquɫpandin/**: ☜ **داقڵیشاندن**
**ڕاقەتان / řaqetan/**: چاوگ. سەرنخوون بوون ☲ سرنگون شدن
**ڕاقەتاندن / řaqetandin/**: چاوگ. ١. کار لێ ساندنەوە؛ لە سەر کار لابردن ٢. جوێ کردنەوە ☲ ١. عزل کردن ٢. جُدا کردن
**ڕاقەتاندی / řaqetandî/**: ناوەلناو. لە کار لادراو؛ لە سەر کار لابراو ☲ معزول
**ڕاک / řak/**: ناو. کوول؛ کویل؛ کەڤری مەزنی بن‌والا؛ گاشەبەردی ژێر بەتاڵ ☲ صخره‌ای که زیرش خالی است
**ڕاکالین / řakalîn/**: چاوگ. ١. ڕاپەڕین ٢. بە غار ڕۆیشتن (چوارپێ) ☲ ١. برجهیدن ٢. دویدن (چهارپایان)
**ڕاکت / řakit/**: ناو. ١. ئاڵقەیەکی هێلکۆکەیی و دەسکدار کە ناوەکەیان تۆڕچن کردووە و لە یاری تنیس یان بەدمینتۆندا تۆپی پێ لێ‌ئەدەن ٢. پەڕەیەکی خڕی دەسکدار کە بۆ یاری پینگ‌پۆنگ بە کار دێت ٣. هاژەک؛ مووشەک ☲ ١و٢. راکت ٣. موشک
**ڕاکردوو / řakirdû/**: ناوەلناو. ڕەمیا؛ هەلاتوو ☲ فراری
**ڕاکشان / řak(i)şan/**: چاوگ. ١. پاڵ کەفتن؛ هەلاژیان ‹ڕاکشێ تاوێ سەر بنێرە سەر ڕانم/ با بگریم بۆ دلێ بۆ گولێ دۆڕانم! «گۆران»› ٢. بە سەر زەویدا خزین ٣. دەرکشان ‹یا عەکسی ئاسمانە لە ئاوێنەدا کەوا/ ئەستێرەکانی ڕابکشێن وەک شەهابی

نــوور «نــالی»› 🇮🇷 ١. دراز کشــیدن ٢. خزیــدن ٣. برکشیده شدن

**ڕاکشـاندن / řak(i)şandin/**: چـاوگ. ١. لــە ســەر زەوی داکێشان ٢. هەڵگرتن ‹بـارام کچـا فـەرهاد ڕاکشاند› 🇮🇷 ١. بر زمین کشیدن ٢. بُلند کردن

**ڕاکشـاو / řak(i)şaw/**: ئاوەڵــناو. ١. پــاڵ‌کەفتــە؛ هەلاژیاو ٢. کێشراو ‹شیری دەستی شـێری ئالایـە برۆ ڕاکشاوەکەت/ جەرگی لاوێکـی هـەژاری کـوردی ورد پێ بنجنە! «هێمن»› ٣. *[کنایە]* بالابـەرز 🇮🇷 ١. درازکشیده ٢. کشیده ٣. بلندقد

**ڕاکشی / řak(i)şî/**: نـاو. کـێش؛ ڕاکـێش 🇮🇷 کـش؛ کشش

**ڕاکوتـان / řakutan/**: چاوگ. لێـک جـۆش دان 🇮🇷 وصل کردن

**ڕاکوشان / řakuşan/**: ☜ **کوشین**

**ڕاکوشین / řakuşîn/**: ☜ **کوشین**

**ڕاکۆلین / řakolîn/**: ☜ **ڕاسان ـ١**

**ڕاکۆڵین / řakořîn/**: ☜ **ڕاسان ـ١**

**ڕاکەتن / řaketin/**: چاوگ. ڕاکەوتن: ١. ڕازان؛ پاڵ کەفتن؛ هەلاژیان ٢. چاوەنۆڕی دەرفەت بوون ٣. کولە گـرتن ‹لێـی ڕاکـەتم بـزانم پشتەسـەرم چـی دەڵێ› 🇮🇷 ١. دراز کشیدن ٢. مُنتظر فرصت شـدن ٣. فالگوش ایستادن

**ڕاکەر / řaker/**: ☜ **ڕاستکەر**

**ڕاکەش / rakeş/**: ئاوەڵناو. سەرنجڕاکـێش؛ دڵـڕفێن ‹ژنەک ڕاکەش و تەشقەلە کەرن› 🇮🇷 جذاب

**ڕاکەشی / rakeşî/**: نـاو. دڵڕفێنی؛ ســەرنجڕاکێشـی ‹کچم بەو ڕاکەشییە نەبینیبوو› 🇮🇷 جذابیت

**ڕاکەوتن / řakewtin/**: ☜ **ڕاکەتن**

**ڕاکەوتە / řakewte/**: ناو. وەرێ‌کەوتوو 🇮🇷 راهی

**ڕاکـەوەی / řakewey/**: نـاو. ڕەوتی داســرەوتن 🇮🇷 آرامش

**ڕاکیشە / řakîşe/**: ☜ **ڕکێشە**

**ڕاکێش[1] / rakêş/**: نـاو. کاری کێشان بە سەر زەویـدا ‹ڕاکێشیان کرد و بردیان› 🇮🇷 کار بر زمین کشیدن

▪ **ڕاکێش[2]**: پاشەوشـە. ڕاکێشــەر ‹ســەرنجڕاکـێش› 🇮🇷 ـکش

**ڕاکێشان / rakêşan/**: چـاوگ. ١. بـە سـەر زەویـدا خزاندن و بردن ‹پیری وا هات و ئەجەل لێم دیـارە/ ڕەنگە ڕامکێشێ بەرەو ئەو خوارە «ئاوات»› ٢. بەرەو خۆ هێنـان ‹سـەرنج ڕاکێشـان› ٣. لـە دوو دان و درێژ کردن ‹گوریسەکە ڕاکێشـە!؛ لاقـت ڕاکێشـە!› ٤. ڕفاندنی کچ بە زۆری ٥. لێدان ‹بـە قۆچـەقانی لە سینگی کـۆترێکی ڕاکێشـا و برینـداری کـرد› ٦. وەشاندن ‹بە قەسدی گەردنی دڵ تورکی چاوت/ بە ڕوومـا تێخـی ڕاکێشـا لـە ئـەبروو «سـالم»› 🇮🇷 ١. کشاندن؛ کشـان ـ کشـان بـردن ٢. بـە سـوی خـود کشیدن ٣. دراز کردن ۴. ربودن دختر ۵و۶ زدن

**ڕاکێشران / řakêşran/**: چـاوگ. ڕامدین؛ کێشـران؛ ڕاخران 🇮🇷 گُستردن

**ڕاکێشە / rakêşe/**: ناو. ١. تایبەتمەندییەک لە برێ تەندا کە تەنی‌تر بەرەو خۆ دەکێشـن ‹ڕاکێشـەی مەگنـەتیکی› ٢. تایبەتمەنـدی لــە شــت یــان کەسـێکدا کـە سـەرنج و هـۆگرەتی بـەرەو خـۆ دەکێشــێ ‹ڕاکێشــەی سیکســی› ٣. ئــەوەی سەرنجڕاکێشە ‹ڕاکێشەی گەشـتیاری› ٤. *[فیزیک]* ئەو هێزەی پاژەکانی تـەنێک لێـک‌قـایم دەکـا و ناهێڵێ لێک هەڵوەشێن 🇮🇷 ١تا ۴. جاذبە

▣ **ڕاکێشـەی زەوی**: هێزێکـی نـاو دڵـی زەوی کـە هــەموو شــتێک بــەرەو خــۆی ڕادەکێشــێ 🇮🇷 جاذبەی زمین

**ڕاکێشەی مەگنەتیکی**: هێزی ڕاکێشـان لـە مـاکی ئاسنڕفێندا 🇮🇷 جاذبەی مغناطیسی

**ڕاکێشەر / rakêşer/**: ئاوەڵـناو. کێشنە؛ کێشـەر؛ بـە تایبەتمەنــدی ڕاکێشــانەوە ‹ڕاکێشـــەری خۆشەویستی› 🇮🇷 جاذب

**ڕاکێشی / řakêşî/**: ناو. کەش؛ چۆنیەتی ڕاکێشان ☰ جاذبه

**ڕاگر[1] / řagir/**: ناو. ١. ☜ **ڕێگر** ٢. ئاگاداریکەر ٣. ویسێنەر ‹هەن کە شیعر و شاعری بە ڕاگر و گنخێنەر و خنکێنەری کۆمەڵ ئەزانن «سوارە»› ☰ ١. ☜ **ڕێگر** ٢. نگهدارنده ٣. متوقفساز

**ڕاگر[2]**: ئاوەڵناو. پارێزەر: ١. چاوەدێری وا کە کاری پاراستن و ڕاگرتنی لێ بوەشێتەوە ٢. بەرلێگر ‹دیواری ڕاگر› ☰ ١. نگهدارنده ٢. حفاظتی

• **ڕاگر[3]**: پاشەوشە. ١. ـ پارێز ‹ژنێکی ماڵڕاگرە› ٢. ـ ویسێن ‹خوێنڕاگر› ☰ ١. ـ بان؛ ـ پا ٢. بندآور

**ڕاگرتن / řagirtin/**: چاوگ. ١. ئاگاداری کردن ‹خەریک بووم ڕاگرم دوو گۆلەتاجی/ بەوان ڕاوێ بکەم بۆ ناعیلاجی «هێمن»› ٢. بەربەست کردن ‹کارەکەی ڕاگرت، نەیهێشت بکرێ› ٣. وەستاندن؛ ڕاوەستاندن ‹ماشێنەکە ڕاگرە!› ٤. بە دەستەوە گرتن؛ لە سەر دەست هەڵگرتن ‹سەری ئەو گوریسەم بۆ ڕاگرە!› ☰ ١. نگهداری کردن ٢و٣. متوقف کردن ۴. نگهداشتن

**ڕاگرتی / řagirtî/**: ئاوەڵناو. بە ڕوومەت و سەنگین و گران ☰ مُحترم

**ڕاگڤاشتن / řag(i)vaştin/**: ☜ **ڕاگوشین**

**ڕاگواستن / řag(i)wastin/**: چاوگ. ڕاگوێزان؛ ڕاگوێزتن: ١. گوێزانەوە؛ شتێ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر بردن ٢. گواستنەوە بە نهێنی ☰ ١. انتقال دادن ٢. مخفیانه انتقال دادن

**ڕاگوزار / řaguzar/**: ☜ **ڕاگوزەر**

**ڕاگوزەر / řaguzer/**: ناو. ڕاگوزار: ١. ڕێباز؛ ڕێگەی هاتوچۆ ٢. ڕێبوار؛ کەسێ کە بە ڕێگەیەکدا دەڕوا ☰ ١. رهگذار ٢. رهگذر

**ڕاگوشین / raguşîn/**: چاوگ. ڕاگڤاشتن؛ گووشین بە دەست ☰ افشردن

**ڕاگومکێ / řagumkê/**: ناو. ڕێگومکێ؛ شوێنەگومکێ ☰ عمل رد گم کردن

**ڕاگوێز[1] / řag(i)wêz/**: ناو. جێگۆڕکێ ☰ انتقال

**ڕاگوێز[2]**: ئاوەڵناو. ڕاگوێزەر؛ بە تایبەتمەندی ڕاگواستنەوە ☰ مُنتقل‌کننده

• **ڕاگوێز[3]**: پاشەوشە. جێبەجێکەر ‹بارڕاگوێز› ☰ مُنتقل‌کننده

**ڕاگوێزان / řag(i)wêzan/**: ☜ **ڕاگواستن**

**ڕاگوێزتن / řag(i)wêztin/**: ☜ **ڕاگواستن**

**ڕاگوێزەر / řag(i)wêzer/**: ☜ **ڕاگوێز[2]**

**ڕاگۆ / řago/**: ناو. جۆرە خواردنێکی ڕۆژاوایی لە چەشنی تاسکەباب ☰ راگو

**ڕاگۆستن / řagostin/**: چاوگ. ڕاگوێزان ☰ مُنتقل کردن

**ڕاگە / řage/**: ناو. ڕێ؛ ڕێگا؛ ڕێگە؛ شوێنی هاتوچۆ ‹دیدەش یەند خەیاڵ باڵات بی تێشدا/ ڕاگەی خاو نەبی بویەرۆ پێشدا «مەولەوی»› ☰ راه

**ڕاگەش / rageş/**: ئاوەڵناو. ١. حەنەکچی؛ قسەخۆش ٢. نازکەر ☰ ١. شوخ ٢. نازکننده

**ڕاگەهاندن / řagehandin/**: ☜ **ڕاگەیاندن**

**ڕاگەیاندن / řageyandin/**: چاوگ. ڕاگەهاندن: ١. هەموان تێگەیاندن ‹ئەورووپا نووسیویە بۆ تۆ یەک بە یەک وەک داستان/ تۆش بە چاکی ڕایگەیەنە بۆ نەخوێندەی کوردەکان «قانع»› ٢. گەیاندنی پەیام بە کەس یان کۆمەڵێکی تایبەت ☰ ١. ابلاغ کردن ٢. رساندن پیام

**ڕاگەیشتن / řagey(i)ştin/**: چاوگ. ١. تێڕاکردن؛ کورتی نەهێنان ‹نانەکە بە هەموان ڕاگەیشت› ٢. کۆنترۆڵ کردن ٣. ☜ **ڕاگەیین** ☰ ١. کفایت کردن ٢. کنترل کردن ٣. ☜ **ڕاگەیین**

**ڕاگەیین / řageyîn/**: چاوگ. ڕاگەیشتن؛ گەیشتنی ڕاسپێری ‹پەیامی من بە گوێی ئەم دولبەرە نازدارە ڕاناگا/ نەسیم بێسیم دەبینێ، شل دەبێ، بەم کارە ڕاناگا «هێمن»› ☰ رسیدن پیام

**ڕاگەیێن** / řageyên/: ناو. کەسێ کە سپاردەی قسە دەگەیێنێ پیامرسان

**ڕاگەیێنەر** / řageyêner/: ناو. کەرەلیاس؛ چێرڤان؛ جارچی جارچی؛ مُنادی

**ڕاگەیێنی** / řageyênî/: ناو. پڕوپاگەندە؛ بانگەشە پروپاگاند؛ تبلیغ

**ڕاگیر[1]** / řagîr/: ناو. ڕێگر ‹جە پەنجا ئاستان ڕاگیر مەنیشان/ ئەوان چێمە مەپەرسانێ هەوالا «سەیدی»› راهزن

**ڕاگیر[2]**: ئاوەڵناو. بەرگر؛ پێشگر؛ قۆرت مانع

⊡ **ڕاگیر بوون**: وەستان: ١. وەستانەوە ٢. لادان ‹لەوێ ڕاگیر نابم، زوو دەگەڕێمەوە› ١. بند آمدن ٢. توقف کردن

**ڕاگیر کردن**: بەر پێ گرتن؛ وەستاندن ‹ڕاگیری کردین سێ چارەک سەعات/ تویشوو نیوە بوو وردە دوایی هات «گۆران»› متوقف کردن

**ڕاگیران** / řagîran/: چاوگ. ١. پێش گیران ٢. ئاوەدز کردنی برین ١. متوقف شدن ٢. عفونت کردن زخم

**ڕاگیراو** / řagîraw/: ئاوەڵناو. هەڵگراو نگهداری شده

**ڕاگیرنامە** / řagîrname/: ناو. ١. پسوولەی قۆڵبەس کردن ٢. پسوولەی ڕاگرتنی کار ١. حُکم بازداشت ٢. حُکم توقف کار

**ڕاڵی** / řałî/: ناو. جۆرێ کێبەرکێی ماشین لە جادەی ئاساییدا بۆ هەڵسەنگاندنی لێزانی و وریایی ئاژوێن رالی

**ڕام[1]** / řam/: ناو. *[کۆن]* ڕەحم؛ بەزەیی ‹مەر هەر خوداوەند کەرەم بێشومار/ یا ڕام بە تۆ دا یا بە من قەرار «بێسارانی»› رحم

**ڕام[2]**: ئاوەڵناو. دەستەمۆ؛ دەسەمۆ؛ کەوی؛ ڕامبوو(گ) رام

⊡ **ڕام بوون**: کەوی بوون؛ لە سڵی دەست هەڵگرتن. هەروەها: **ڕام کردن** رام شدن

**ڕاماشتن** / řamaştin/: ☜ **ڕاپێچان ـ٣**

**ڕاماڵ** / řamał/: ناو. کاری ڕاستەوڕاست بەرخۆدان و ماشتن رفتوروب

⊡ **ڕاماڵ دان**: ١. ماشتن؛ ماڵین بە دەست ٢. ڕاڕفاندن بە هێزی دەست؛ توند و تێکڕا پڕ بە شتێکدا کردن ١. رفتوروب کردن ٢. قاپیدن

**ڕاماڵان** / řamałan/: ☜ **ڕاماڵین**

**ڕاماڵین** / řamałîn/: چاوگ. ڕاماڵان؛ ماشتنەوە؛ ڕاستەوڕاست بەرخۆدان و ماشتن ‹چ خۆشە هێزی ڕەنجبەر ڕابماڵێ/ قەلا و زیندانی ئاغای بەدفەسالم! «قانع»› با دست روبیدن

**ڕامان** / řaman/: چاوگ. ١. دە بیرەوە چوون؛ مات بوون و بیر کردنەوە ‹مەم بیستی ئەمانە تۆزێ ڕاما/ درکاندی دەمی لە جێی وەراما «هەژار، *مەموزین*»› ٢. سەرسوورمان ٣. *[مەجاز]* ویستان؛ لە جووڵە کەوتن ‹لە هەر شوێنێ ڕاماوە، داماوە، کاری تەواوە/ ئەزانێ لەبێ هەر بژێ و بازوێ/ تا بژی تا بمێنێ «سوارە»› ١. اندیشیدن ٢. مُتحیر ماندن ٣. متوقف شدن

**ڕاماو** / řamaw/: ئاوەڵناو. ڕامای: ١. دە بیرەوە چوو ٢. سەرگەردان ١. در اندیشە فرورفتە ٢. سرگردان

**ڕامای[1]** / řamay/: چاوگ. وە ڕێ کردن؛ خستنە ڕێ راهی کردن

**ڕامای[2]**: ☜ **ڕاماو**

**ڕامبوو(گ)** / řambû(g)/: ☜ **ڕام[2]**

**ڕامداندن** / řam(i)dandin/: چاوگ. ڕامەزاندن؛ ڕاخستن؛ پان کردنەوە گُسترانیدن

**ڕامدین** / řam(i)dîn/: چاوگ. ڕاخران؛ پان کرانەوە؛ ڕاکێشران گُستردن

**ڕامکراو** / řamkirdû/: ئاوەڵناو. ئارمین؛ دەستەمۆ رام

**رامکه / řamke/:** ☜ **راوکه**

**رامل / řamil/:** ناوەڵناو. مەحکووم؛ داماو لە سەلماندنی قسە و خواست و ناچار بە قەبووڵ کردن ≌ محکوم

◻ **رامل بوون:** قسە پێنەمان؛ پەک کەوتن لە وەرام ‹بە هیچ جۆرێ رامل نابێ› ≌ محکوم شدن

**رامل خستن:** ١. قسەی ئاخر کردن ٢. قسە پێ نەهێشتن؛ پەک خستنی هاودوێن لە وەرام ≌ ١. اتمام حُجت کردن ٢. محکوم کردن (در بحث)

**رامو / řamû/:** ناوەڵناو. رامین؛ هێمن ≌ آرام

**راموز / řamûz/:** ☜ **راموس**

**راموس[1] / řamûs/:** ناو. رامووز؛ رامیس؛ ماچ؛ پاچ ≌ بوسه

• **راموس[2]:** پاشەوشە. ـ رامووز؛ ـ رامیس؛ ماچکەر ‹دەس‌رامووس› ≌ ـ بوس

**راموسان / řamûsan/:** ☜ **راموسین**

**راموساندن / řamûsandin/:** چاوگ. رامووسین؛ ماچ کردن؛ پاچ کردن ≌ بوسیدن

**راموسانک / řamûsanik/:** ناو. بۆس؛ ماچ؛ ماچە ≌ بوسه

**راموسین / řamûsîn/:** چاوگ. رامووسان؛ ماچ کردن؛ پاچ کردن ≌ بوسیدن

**رامه / řame/:** ☜ **راوکه**

**رامەزاندن / řamezandin/:** ☜ **رامداندن**

**رامی / řamî/:** ناو. ١. یارییەکی بە پەڕانتۆیە ٢. دەستەمۆیی ≌ ١. رامی ٢. حالت رام بودن

**رامیار / řamyar/:** ناو. ١. سیاسەتزان ٢. ڕەوکەوان؛ ئاگاداری ڕەوەی ئەسپ ٣. شوان ≌ ١. سیاستمدار ٢. نگهبان رمەی اسب ٣. چوپان

**رامیاری / řamyarî/:** ناو. ١. سیاسەت ٢. ڕەوکەوانی ٣. شوانی ≌ ١. سیاست ٢. نگهبانی رمەی اسب ٣. چوپانی

**رامیس / řamîs/:** ☜ **راموس**

**رامین / řamîn/:** ☜ **رامو**

**رامینان / řamînan/:** چاوگ. ڕوانین ≌ نگریستن

**ران / řan/:** ناو. ١. ڕاهن؛ ڕەهن؛ لە ئەژنۆ بەرەو ژوور تا سمت ٢. گۆشتی ئەو بەشە لە لەش ٣. گەلە؛ ڕەوە؛ کۆمەڵێ ئاژەڵ بەتایبەتی بزن و مەڕ ‹ڕان بێ شوان، گورگ ئەیخوا «مەسەل»› ≌ ١و٢. ران ٣. گلّه

**رانان / řanan/:** چاوگ. ١. ڕانوان؛ ڕانواندن؛ نیشان دان؛ بەرچاوی حەشامات نان ‹وەک گوڵ بە شنەی بەیان خۆیان ڕادەنا و دەچوون› ٢. لە سەر سنگ ئاو خواردنەوە؛ دەم دە کانی ژەندن ٣. شوێن کەوتن بۆ گرتن ٤. *(مەجاز)* بەدیهێنان؛ خولقاندن ‹ئەو ڕۆژە خودا سانی گیانی ڕانا/ دەیزانی بە کردەوەم، خودایە و زانا «هەژار، *چوارینەکانی خەیام*»› ≌ ١. به رُخ کشیدن ٢. دمر آب از چشمه خوردن ٣. تعقیب کردن ۴. آفریدن

**راناو / řanaw/:** ناو. ١. *(ڕێزمان)* جێناو؛ بەرناڤ؛ هێما بۆ ناو لە ڕێزماندا ٢. نیشانی خەڵک دراو ≌ ١. ضمیر ٢. به نمایش گذاشته شده

**رانبار / řanbar/:** ناو. ئاژۆ؛ لێخوڕ؛ کەسێ کە بارەبەر یان ماشێنێک بەڕێوە دەبا ≌ راننده

**رانت / řant/:** ناو. سەرپشکایەتی؛ سەربەشایەتی؛ کاکەبەشانەی حکوومەتی؛ سەربەشانەیەکی تایبەت (ئابووری، رامیاری یان فەرهەنگی) کە لە لایەن حکوومەتەوە درابێتە کەس یان دامەزراوەیەک ≌ رانت

**رانتخۆری / řantxorî/:** ناو. کار و ڕەوتی کەڵک وەرگرتن لە کاکەبەشانەی حکوومەتی ≌ رانتخواری

**راندن / řandin/:** چاوگ. ١. ئاژۆتن؛ لێخوڕین ٢. هاویشتن؛ خستن ≌ ١. راندن ٢. پرت کردن

**رانک / řan(i)k/:** ناو. ڕانە؛ ڕانی؛ شاپک؛ شەرواڵ/

پاتۆڵی له بووزوو ≡ شلوار از شال پشمی

**رانکوچۆخه** / ran(i)k û çoxe/: ☜ **رانك‌وچۆغه**

**رانکوچۆغه** / řan(i)k û çoğe/: ناو. رانک‌وچۆخه؛ چۆخه‌ورانک؛ شال و شاپک؛ که‌وا و پانتۆڵی له بووزوو ≡ فرنج شلوار از شال پشمی

**رانکه** / řanke/: ناو. تیسکی ده‌وری گوانی ئاژه‌ڵ که له ترسی درک تێ‌چه‌قین برینگی ناکه‌ن ≡ پشم اطراف پستان بُز و گوسفند که برای محفوظ ماندن پستان از خار، چیده نمی‌شود

**رانگه** / řange/: ☜ **ڕۆنانگه**

**رانما** / řan(i)ma/: ☜ **ڕێنوێن**

**رانمایی** / řan(i)mayî/: ☜ **رانمونی**

**رانمونی** / řan(i)mûnî/: ناو. ڕێنوێنی؛ رانمایی؛ کار و ڕه‌وتی ڕێ پیشاندان ≡ راهنمایی

**راننده** / řaninde/: ناو. ئاژۆ؛ ئاژوه‌ر؛ لێخوڕ؛ شۆفێر؛ ڕانیار؛ سه‌یاق ≡ راننده

**رانوان** / řan(i)wan/: ☜ **رانان-۱**

**رانواندن** / řan(i)wandin/: ☜ **رانان-۱**

**رانوما** / řanuma/: ☜ **رانوێن**

**رانوێن** / řan(i)wên/: ناو. ڕێنوێن؛ رانوما؛ ڕێشانده‌ر ≡ راهنما

**رانه** / řane/: ☜ **رانك**

**رانه‌بێره** / řanebêre/: ناو. مه‌ڕه‌بێره؛ دانه‌بێره؛ کاتی نیوه‌ڕۆ که شوان مه‌ڕ دێنێته‌وه بۆ دۆشین ‹مه‌شکه بژێ چ خێره/ مه‌ڕ گه‌یی رانه‌بێره/ کابان ده‌ڵێی که‌نێره «فولکلور»› ≡ ظهر، زمان برگشتن گلّه از صحرا

**رانه‌ر** / řaner/: ناو. به‌دیهێنه‌ر ≡ آفریننده

**رانه‌رم** / řanerm/: ئاوه‌ڵناو. نه‌رم و خۆش‌چێژه ≡ نرم و خوشمزه

**رانه‌کی** / řanekî/: ناو. پالوو؛ پالۆ ≡ پاردُم

**رانی** / řanî/: ☜ **رانك**

**رانیار** / řanyar/: ☜ **راننده**

**رانین** / řanîn/: چاوگ. ئاژۆتن؛ لێخوڕین ‹رانیم فه‌رمس چه‌پ و ڕاست/ ڕێگه‌م نه‌برده مه‌قسوود «شێخ ڕه‌زا»› ≡ راندن

**راو**[1] / řaw/: ناو. ۱. ڕاڤ؛ شکار؛ ئشکار؛ که‌ڕوه؛ شڒ؛ کاری وه‌گیر خستنی گیانه‌وه‌ری کێوی یان هه‌ڵاتوو ۲. نێچیر؛ نچیر؛ ئه‌و گیانه‌وه‌ره‌ی که به کوشتن، زامار کردن یان ته‌ڵه گیراوه ۳. گزی؛ فێڵ ٤. په‌ڵه‌ی سه‌ر و چاوی ژنی تۆڵدار ٥. شیله‌ی هه‌نگوین ≡ ۱و۲. شکار ۳. کَلَک ۴. لکّه‌ی صورت زن آبستن ۵. عسل مُصفا

⊡ **راو کردن**: ڕاڤ کرن ≡ شکار کردن

**راو نان/ نیان**: ۱. ده‌ر کردن؛ وه‌ده‌ر نان ۲. دانه دوو؛ دانه په‌ی؛ شوێن که‌وتن بۆ گرتن ≡ ۱. راندن ۲. دنبال کردن به قصد گرفتن

**راو نران/ نریان**: ده‌ر کران؛ وه‌ده‌ر نران ‹ئاخر هه‌ر بۆیه له دنیا ڕاو نراوم که له سه‌ر خۆم وه جواب هاتووم! ... «هه‌ژار، چێشتی مجێور»› ≡ رانده شدن

• **راو**[2]: پاشگر. کایه؛ گه‌مه ‹سه‌گه‌ڕاو› ≡ ـ بازی

**راوار** / řawar/: ئاوه‌ڵناو. خۆشڕه‌و؛ خۆشبه‌ز؛ چه‌له‌ک ≡ رهوار

**راوارتن** / řawartin/: چاوگ. گواستنه‌وه؛ گۆزانه‌وه ≡ جابه‌جا کردن

**راواره** / řaware/: ناو. گیایه‌کی پایای گه‌ڵاورد و گوڵ بنه‌وشه، له ده‌م یالان ده‌ڕوێ ≡ گل گندم

**راواز** / řawaz/: ئاوه‌ڵناو. به‌ڕێ؛ له دۆخی چووندا ‹سارا ڕاوازه بۆ مه‌هاباد› ≡ راهی

**راوازه** / řawaze/: ناو. ڕاوازه‌ڕان؛ شوێنی هات‌وچۆی ڕان له شاخ و کێوان، که به هۆی پێداچوونی زۆره‌وه، بۆته چه‌ن تووله‌ڕێگه‌ی له په‌نای یه‌ک ≡ خطوط مسیر گله در کوه و صحرا

**راوازه‌ران** / řawazeřan/: ☜ **راوازه**

**راوان** / řawan/: ناو. ورینه؛ ورێنه؛ وراوه؛ قسه‌ی

بێ مانای نەخۆشی بێ هۆش 🇮🇷 هذیان

**ڕاواندن** / řawandin/: چاوگ. تێپەڕ. //ڕاواندت؛ دەڕاوێنی؛ بڕاوێنە// ١. وڕێنە کردن؛ وڕاوە کردن؛ ڕاوای ٢. تێپەڕاندن؛ دانەسەر ‹ئێستە بە تووتن شەو ئەڕاوێنم/ وەک دایک ڕۆڵەی خۆم ئەلاوێنم «موفتی پێنجوێنی»› 🇮🇷 ١. هذیان گفتن ٢. از سر گذراندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەڕاوانەوە

**ڕاوای** / řaway/: ☜ **ڕاواندن ـ١**

**ڕاوباز** / řawbaz/: ئاوەڵناو. فێڵباز؛ گزیکار 🇮🇷 حقەباز

**ڕاوبان** / řawban/: ☜ **ڕێوبان**

**ڕاوچی** / řawçî/: ناو. ڕاڤەڤان؛ ڕاڤیار؛ ڕاویار؛ ڕاوکەر؛ نچیرکار؛ نەچیروان؛ نێچیرڤان؛ ڕاڤرۆ؛ سەیدەوان؛ سەیڤان؛ ڕاڤکار؛ کەسێ کە گیانەوەران ڕاو دەکا 🇮🇷 شکارچی

**ڕاوچیگەری** / řawçîgerî/: ناو. کار و پیشەی ڕاویار 🇮🇷 شکارچی‌گری

**ڕاور** / řawir/: ئاوەڵناو. لاور؛ دەشتی؛ کێوی؛ بە ژیانێکی تەواو سروشتی و دوور لە خەڵک 🇮🇷 وحشی

**ڕاوراندن** / řaw(i)randin/: چاوگ. ڕزگار بوون؛ دەرباز بوون 🇮🇷 خلاص شدن

**ڕاورتن** / řawirtin/: چاوگ. لێک‌بڵاو بوون؛ هەر یەک بە لایەکا چوون 🇮🇷 پراکنده شدن

**ڕاوڕاوان** / řawřawan/: ناو. ڕاوڕاوێن: ١. هەڵات ـ هەڵات ٢. یارییەکی چەن کەسی دوو تیمییە، گرۆیێ لە شوێنێکی دیاریکراو چاوەدێری دەکەن کەسی تێ نەچێ، ئەو گرۆیەی دەبێ بیگەنێ 🇮🇷 ١. تعقیب و گریز ٢. از بازی‌ها

**ڕاوڕاوێلکە** / řawřawêlke/: ☜ **ڕەوڕەوە ـ٢**

**ڕاوڕاوێن** / řawřawên/: ☜ **ڕاوڕاوان**

**ڕاوشکار** / řawş(i)kar/: ناو. ڕاووشکار؛ گەلە ڕاو؛ ڕاو بە گەلەکۆیی 🇮🇷 شکار گروهی

**ڕاوک** / řawik/: ناو. ڕاڤەک؛ ڕاوەک؛ شیرپاڵێو؛ شیرپاڵۆ؛ پاڵوێنەی شیر و هەر شتێکی تراو 🇮🇷 پالونه

**ڕاوکە** / řawke/: ناو. ڕامکە؛ مارکە؛ ڕامە؛ ڕوممە؛ فاڵ؛ ئەو هێلکەی دە بن مریشکی هێلکەکەری دەنێن با هێلکەی تازەی لە پاڵی دانێ 🇮🇷 فال؛ تخمی کە زیر مرغ گذارند تا تخم جدید را کنار آن بگذارد

**ڕاوکەر** / řawker/: ☜ **ڕاوچی**

**ڕاوگە** / řawge/: ناو. ڕاڤگە؛ نێچیرگا؛ نەچیرگ؛ جێڕاو 🇮🇷 شکارگاه

**ڕاوگەوان** / řawgewan/: ناو. پاسەوانی ڕاوگە 🇮🇷 شکاربان

**ڕاوگەوانی** / řawgewanî/: ناو. پاسەوانی لە ناوچەگەلی ڕاو بۆ بەرگری لە ڕاوی ناڕەوا و زێدەبەدەر 🇮🇷 شکاربانی

**ڕاووڕوو** / řaw û řû/: ناو. زمانلووسی؛ مەرایی؛ کلکەسووتە 🇮🇷 چاپلوسی

**ڕاووڕووت** / řaw û řût/: ناو. ڕێگری و دزی ‹یەک بە پزیشکی یەک بە ئاغایی/ یەک بە ڕاووڕووت یەک بە کوێخایی «قانع»› 🇮🇷 راهزنی

**ڕاووڕیس** / řaw û řîs/: ناو. بەنی تەون 🇮🇷 ریس بافندگی

**ڕاووڕیو** / řaw û řîw/: ناو. فێڵوفەرەج؛ دزی‌وفزی 🇮🇷 دوز و کلک

**ڕاووشکار** / řaw û ş(i)kar/: ☜ **ڕاوشکار**

**ڕاوە**[١] / řawe/: ☜ **ڕاڤە**

**ڕاوە**[٢]: پێشوشە. کاری ڕاو کردن ‹ڕاوەبەراز؛ ڕاوەماسی› 🇮🇷 شکار

**ڕاوەبار** / řawebař/: ناو. ڕاوەکەوی ئاخری هاوین بۆ کەوەبارِ 🇮🇷 شکار کبک در آخر تابستان

**ڕاوەدوو** / řawedû/: ناو. کار و ڕەوتی نانە شوێن کەس یان شتێکەوە 🇮🇷 تعقیب

⊡ **ڕاوەدوو نان:** دانە پەی؛ ڕاو نان ‹کە یەکترینمان ئەنا ڕاوەدوو/ گا یاری کردن، گا پێکەنین بوو «فولکلۆر»› 🇮🇷 دُنبال کردن

**ڕاوەڕووت / řaweřût/:** ☜ **ڕاڤڕووت**

**ڕاوەڕێوی / řaweřêwî/:** ناو. ١. ڕاوی ڕێوی ٢. *[کینایە]* فێڵ و گزی 🇮🇷 ١. شکار روباه ٢. نیرنگ

**ڕاوەستان / řawestan/:** چاوگ. ڕاوێستان: ١. بە پاوە وەستان؛ وێسیانە پاوە ‹تۆ ئەگەر هەستی، لە جێ ڕاوەستی، دێو و کافریش/ دێن دەڵێن: بە خودا قیامەت ڕاستە، هەستانی هەیە «نالی»› ٢. وێسان؛ وێسیان؛ خۆگرتن؛ سەبر/ سەور کردن ‹ڕاوەستە ئەوە هاتم› ٣. *[مەجاز]* لە کار بوون ‹ماوەیەکە کارمان ڕاوەستاوە› 🇮🇷 ١. سر پا ایستادن ٢. صبر کردن ٣. متوقف شدن

**ڕاوەستاندن / řawestandin/:** چاوگ. ڕاوێستاندن: ١. لە بزووتن گێڕانەوە ٢. بڵند کردن و بە قیتەوە ڕاگرتن ٣. لە کار خستن ‹کارگەکەیان ڕاوەستاند› 🇮🇷 ١. از حرکت بازداشتن ٢. سرپا نگهداشتن ٣. متوقف کردن

**ڕاوەستاو / řawestaw/:** ئاوەڵناو. ڕاوێستاو: ١. چەق؛ بێبزووتن ٢. وێسیاگ؛ بەپێوە ٣. *[مەجاز]* بەردەوام؛ پاوەجێ ‹هەر ڕاوەستاو بی!› 🇮🇷 ١. ثابت؛ راکد ٢. برپا ایستاده ٣. پایدار

**ڕاوەستاوی / řawestawî/:** ناو. پایەداری؛ بەردەوامی؛ بەرقەراری؛ دۆخی هەرمان 🇮🇷 پایداری

**ڕاوەستۆخ / řawestox/:** ئاوەڵناو. هەمیشە نیشتەجێ 🇮🇷 مُقیم

**ڕاوەش / řaweş/:** ناو. تەکانی زۆر 🇮🇷 تکان شدید

**ڕاوەشان / řaweşan/:** چاوگ. ڕاوەشین؛ جووڵانەوە بە توندی 🇮🇷 به شدت تکان خوردن

**ڕاوەشاندن / řaweşandin/:** چاوگ. ڕاتەکاندن؛ جووڵاندنەوە بە توندی 🇮🇷 به شدت تکان دادن

**ڕاوەشین / řaweşîn/:** ☜ **ڕاوەشان**

**ڕاوەشێنران / řaweşênran/:** چاوگ. ڤەتەکان؛ تەکان؛ تەکێنران 🇮🇷 تکانده شدن

**ڕاوەشێنراو / řaweşênraw/:** ئاوەڵناو. تەکاو؛ شەکاوە 🇮🇷 تکان داده شده

**ڕاوەک / řawek/:** ☜ **ڕاوک**

**ڕاوەکانی / řawekanî/:** ناو. ڕاوی کەو بە تۆڕ 🇮🇷 شکار کبک با تور

**ڕاوەکەر / řaweker/:** ناو. ١. شرۆڤەکەر ٢. دووخاڵ (:) کە نیشانەی مانا یان شرۆڤەیە 🇮🇷 ١. شارح ٢. دونقطه (:)

**ڕاوەکەو / řawekew/:** ناو. کەوڕاو؛ ڕاوی کەو 🇮🇷 شکار کبک

**ڕاوەند / řawend/:** ☜ **ڕێواس**

**ڕاوەهەردی / řaweherdî/:** ناو. جۆرێ ڕاوەکەوە لە زستاندا دەکرێ 🇮🇷 شکار زمستانەی کبک

**ڕاوی**[1] **/ řawî/:** ناو. بێژەر؛ وتارگێڕەوە 🇮🇷 راوی

**ڕاوی**[2]**:** ئاوەڵناو. ١. فێرەڕاو (تاژی یان مەل) ٢. پێوەندیدار بە ڕاو یان لەبار بۆ ڕاو 🇮🇷 ١. شکاری (تازی یا پرنده) ٢. شکاری

**ڕاویار / řawyar/:** ناو. ١. ☜ **ڕێبوار** ٢. ڕاوچی؛ ڕاوکەر 🇮🇷 ١. ☜ **ڕێبوار** ٢. شکارچی

**ڕاویش / řawîş/:** ناو. کاری لە ڕوو نووسینەوە 🇮🇷 نسخەبرداری

**ڕاوێ / řawê/:** ناو. وڕاوە؛ وڕینە 🇮🇷 هذیان

**ڕاوێچکە / řawêçke/:** ناو. ڕاوێژکە؛ ڕاوێشکە: ١. بیر لە شتێ؛ ڕەوتی ڕامان ٢. ڕایەڵە؛ ڕایەڵکە؛ هاتوچۆ لە شوێنێک 🇮🇷 ١. تفکر؛ اندیشه ٢. آمد و رفت در یک جا

⊡ **ڕاوێچکە کردن:** هاتوچۆ کردن (لە تەنگەبەرەیەکدا) ‹تاژ و تولە پێش بە پێشی پێڕەو/ ڕاوێچکە دەکەن کە هەڵفڕن کەو «هەژار، *مەموزین*»› 🇮🇷 آمدن و رفتن در فضایی محدود

**ڕاویز / řawêz/**: ناو. تۆڕێکە لە تەلی درکدا کە بە ڕووکاری لووس یان هلۆلیدا دەگرن بۆ گیچ گرتن ☰ رابیتس

**ڕاوێژ / řawêj/**: ناو. ڕابێژ؛ ڕابێژەک: ١. تەگبیر و ڕا؛ کار و ڕەوتی وتووێژ کردن سەبارەت بە بابەت یان بابەتگەلێ بۆ نرخاندن یان دۆزینەوەی چارەسەرێک ‹بۆ سەر زەماوەن خولقی ئەکردین/ کەوتینە ڕاوێژ: بچین یا نەچین «گۆران»› ٢. سۆسە؛ مەرسە؛ مەنی؛ گومان؛ گێز؛ بۆچوونێک بەبێ هۆ و بەڵگە ٣. دەراوی دەم ‹کە قسە دەکا، ڕاوێژی خۆشە› ☰ ١. رایزنی ٢. حدس ٣. لحن سخن

▣ **ڕاوێژ بۆ کەسێ کردن**: ڕێگەیێ نانە بەر کەسێ؛ چارەسەرێ بۆ گرفتی کەسێ دۆزینەوە ☰ راەحلی برای مشکل کسی یافتن

**ڕاوێژ کردن**: تەگبیر کردن؛ لێکۆڵینەوە؛ لێدوان ☰ مشورت کردن

**ڕاوێژخۆش / řawêjxoş/**: ئاوەڵناو. دەمخۆش؛ قسەخوەش ☰ شیرین‌سُخن

**ڕاوێژشیرین / řawêjşîrîn/**: ئاوەڵناو. خۆش‌دەم؛ قسەخۆش ☰ خوش‌صحبت

**ڕاوێژکار / řawêjkar/**: ناو. ڕاوێژیار؛ ڕاوێژەر؛ ڕاوێژکەر: ١. تەگبیرکەر؛ کەسێ کە لە گیر و گرفتێکدا ڕێگایەک دەدۆزێتەوە ٢. ئەو کەسە کە دەگەڵیدا ڕاوێژ دەکەن ☰ ١. رایزن ٢. مُشاور

**ڕاوێژکاری / řawêjkarî/**: ناو. باوگوڕی؛ تەگبیر ☰ مشاوره

**ڕاوێژکە / řawêjke/**: ☜ ڕاوێچکە

**ڕاوێژکەر / řawêjker/**: ☜ ڕاوێژکار

**ڕاوێژگا / řawêjga/**: ☜ ڕاوێژگە

**ڕاوێژگە / řawêjge/**: ناو. ڕابێژگە؛ ڕاوێژگا؛ جێگەی تەگبیر لێکردنەوە ☰ دارالشورا

**ڕاوێژەر / řawêjer/**: ☜ ڕاوێژکار

**ڕاوێژیار / řawêjyar/**: ☜ ڕاوێژکار

**ڕاوێستان / řawêstan/**: ☜ ڕاوەستان

**ڕاوێستاندن / řawêstandin/**: ☜ ڕاوەستاندن

**ڕاوێستاو / řawêstaw/**: ☜ ڕاوەستاو

**ڕاوێشکە / řawêşke/**: ☜ ڕاوێچکە

**ڕاهاتگ / řahatig/**: ☜ ڕاهاتوو

**ڕاهاتن / řahatin/**: چاوگ. ١. داهاتن؛ خوو گرتن ‹بە تاڵ و تفت و سارد و گەرم و ناخۆشی ژیان ڕادێن/ بە گژ تین و بلێسە و بەفر و باران و هەوردا دێن «هێمن»› ٢. فێر بوون ‹دوای دوو-سێ مانگ، بە کارەکە ڕاهاتم› ٣. خاران؛ ئامادە و خۆش بوون ‹لە خۆشی و ناخۆشیدا پێک ڕاهاتووین› ٤. بار هاتن؛ پەروەردە بوون؛ پێگەیشتن ‹منداڵەکان وا ڕاهاتوون، کەس قسەیەکی خراپیان لێ نابیسێ› ☰ ١. عادت کردن ٢. آموزش دیدن ٣. آمادە شدن ۴. تربیت شدن

**ڕاهاتوو / řahatû/**: ئاوەڵناو. چاشاندی؛ ڕاهاتگ؛ هۆژاندی؛ هێن‌بوویی ☰ آموزش‌دیده

**ڕاهشتن / řahiştin/**: چاوگ. پەلامار دان ☰ حملە کردن

**ڕاهن / řahin/**: ☜ ڕان-١

**ڕاهوەند / řahwend/**: ناو. بنکی ڕێواس؛ قالاقنگ؛ ڕەگی کلاوبن ☰ ریوند

**ڕاهەنگاوتن / řahengawtin/**: چاوگ. وەهەنگاوتن؛ بە سەر شتێکدا ڕاکێشان ☰ برکشیدن

**ڕاهی[1] / řahî/**: ناو. ڕایی: ١. ڕەوتی هەڵهاتنی شتی دژوار و چەتوون ٢. وە ڕێ کەوتوو ‹ڕاهی بی وە ڕا مەهدی شی وە پەس/ مەگێلا جە دەور سپاش چوون عەسعەس «خانای قوبادی»› ☰ ١. حل مشکل ٢. رهسپار

**ڕاهی[2]**: ئاوەڵناو. ڕایی؛ ڕزگار ☰ رستگار

**ڕاهێژاندن / řahêjandin/**: چاوگ. لەپڕ و نەکاو بە سەردا دان ☰ ناگهان یورش بردن

**ڕاهێشتن / řahêştin/**: چاوگ. ١. ☜ **ڕاداشتن ـ٤** ٢. ☜ **ڕانەنگاوتن** ٣. *[کنایە]* با لە زگ دەرکردن ٤. پەلامار دان؛ شاڵاو بردن ٥. داوی بە قولاپەوە فڕێ دانە ناو ئاو بۆ ماسی گرتن ☰ ١. ☜ **ڕاداشتن ـ٤** ٢. ☜ **ڕانەنگاوتن** ٣. باد شکم خالی کردن ۴. حمله کردن ۵. قُلاب به آب انداختن

**ڕاهێڵ / řahêł/**: ناو. ڕاهێڵە؛ ڕایەڵە؛ ڕایێل؛ ئەو تاڵانەی لە تەونـدا پۆیان تێوە دەدرێ ☰ تار (بافندگی)

⊡ **ڕاهێڵ بوون**: ١. ڕیز بوونی داوی تەون یان بووزوو بۆ ئامادە بوونی پۆ تێوەدان ٢. *[کنایە]* هەڵەنگووتن و ڕەت بردن و کەوتن ☰ ١. ردیف شدن تارها در بافندگی ٢. سکندری خوردن و اُفتادن

**ڕاهێڵ کردن**: ڕیز کردنی داوی تەون یان بووزوو ☰ ردیف کردن تارهای بافتنی

**ڕاهێڵان / řahêłan/**: چاوگ. ١. ☜ **ڕاداشتن ـ٤** ٢. ☜ **ڕانەنگاوتن**

**ڕاهێڵە / řahêłe/**: ناو. ١. ☜ **ڕاهێڵ** ٢. تەونی داپیرۆشک؛ داو کاکڵەمووشان ☰ ١. ☜ **ڕاهێڵ** ٢. تار عنکبوت

**ڕاهێن / řahên/**: ناو. ڕاهێنەر؛ فێرکەر؛ فێرکار؛ هەڤۆتکار؛ پەروەرشیار؛ ئەوی مرۆڤ یان گیانداری ڕادێنێ یا فێری شتێکی دەکا ☰ مُربی

**ڕاهێنان / řahênan/**: چاوگ. ١. فێر کردن؛ هەڤۆتن ٢. گۆچ کردن؛ متوودان؛ ڕزدایین؛ کەسێک بە خوویەکەوە بەستن ‹منداڵەکانیان ڕاهێنابوو زوو لە خەو هەستن› ٣. خاراندن؛ خۆشە کردن ‹بە خۆشی و ناخۆشی ڕایانهێناوم› ٤. بار هێنان؛ پێگەیاندن؛ پەروەردە کردن ‹ئافەرین! منداڵەکانت باش ڕاهێناوە› ☰ ١. آموزش دادن ٢. عادت دادن ٣. آماده ساختن ۴. تربیت کردن

**ڕاهێندراو / řahênd(i)raw/**: ئاوەڵناو. عاملاو؛ عەلمتی؛ فێرکراو ☰ تعلیم‌دیده

**ڕاهێنراو / řahênraw/**: ئاوەڵناو. دەرهاتگ؛ هەڤۆتی؛ فێرەکارکراو ☰ کارآزموده

**ڕاهێنەر / řahêner/**: ناو. فێرکار؛ ڕاهێن ☰ مُربی

**ڕای**[1] **/ řay/**: ئاوەڵکار. بۆ؛ بۆچی؛ ئەڕای ☰ چرا

**ڕای**[2]: ئامراز. لە بەر ☰ برای

**ڕایاخ / řayax/**: ☜ **ڕاخەر**[1]

**ڕایت / řayt/**: ناو. کار و ڕەوتی لێ هەڵگرتنەوە بە ئامێری تایبەت بەو کارە ☰ رایت

**ڕایج / řayic/**: ئاوەڵناو. باو؛ لەباو؛ بەڕمێن؛ بەبرەو ‹پوولی ڕایج؛ خواردنی ڕایج› ☰ رایج

**ڕایخ / řayix/**: ☜ **ڕاخەر**[1]

**ڕایژە / řayje/**: ناو. ڕاوێژکار ☰ رایزن

**ڕایش / řay(i)ş/**: ناو. لە بەر نویسراو ☰ رونوشت

**ڕایشان / řayşan/**: چاوگ. لە بەر نووسینەوە ☰ نسخه برداشتن

**ڕایمەزن / řaymezin/**: ئاوەڵناو. *[پلار]* لەخۆبایی؛ بەفیز؛ لووتبەرز ☰ مُتکبر

**ڕایە / řaye/**: ناو. شیاوی ☰ شایستگی

⊡ **ڕایە کەوتن**: شیاو بوون ‹کەسی وا چۆن ڕایەی دەکەوێ ڕخنە لە تۆ بگرێ؟› ☰ لیاقت داشتن

**ڕایەت / řayet/**: ناو. کاسبکاری بەردەستی ئاغا ☰ رعیّت

**ڕایەخ / řayex/**: ناو. ڕایاخ؛ ڕایخ؛ ڕاخەر؛ ئەوەی لە سەر زەوی دایدەخەن بۆ لە سەر دانیشتن ☰ زیرانداز

**ڕایەڵ / řayeł/**: ناو. ڕاهێل؛ هەواڵی پۆ ☰ تار (بافتنی)

⊡ **ڕایەڵ کردن**: خەواندنی هەر شتێکی ئەستوونی بە حاڵەتی ئاسۆیی. هەروەها: **ڕایەڵ کران** ☰ بر زمین خواباندن

**ڕایەڵکە / řayełke/**: ☜ **ڕاوێچکە ـ٢**

**ڕایەڵ و پۆ / řayeł û po/**: ناو. ١. تان و پۆ؛ دوو

ڕشتەی تێک تەنراوی پارچە ٢. *[مەجاز]* هەموو بەش و پاژی پێکهێنەری شتێ ‹ڕایەڵ و پۆی شەریعەتیان بەم نەختانە ئاڵۆزاوە! بە کراواتەکەی ملی من تەواو سەریان لێ شێواوە! دە بڕوانە ـکورد گوتەنی ـ کەر لە کوێنە هەڵدێراوە و کوندە لە کوێوە دڕاوە؟! «هەژار، *چوار نامیلکە*»› ٣. *[مەجاز]* جەرگ و هەناو ☰ ١. تار و پود ٢. اجزای سازندەی هر چیز ٣. دل و درون

**ڕایەڵە / řayeḻe/**: ناو. ١. ☜ **ڕاهێڵ** ٢. ☜ **ڕاوێچکە ـ٢** ٣. تۆڕ؛ کۆمەڵێک دامەزراوە، ڕاژە، هێڵ و ئەندامی پێکەوە بەستراو ☰ ١. ☜ **ڕاهێڵ** ٢. ☜ **ڕاوێچکە ـ٢** ٣. شبکە

**ڕایی / řayî/**: ☜ **ڕاهی**

**ڕایێڵ / řayêḻ/**: ☜ **ڕاهێڵ**

**ڕب / řib/**: ناو. ڕوب: ١. دۆشاو؛ شیلە؛ بەرهەمێکی خۆراکی بە شێوەی تراوێکی خەست کە بە کوڵاندن و خەستکردنەوەی ئاوی بڕێ میوەی ترش (وەک: تەماتە و هەنار) پێک دێ ٢. چارەک؛ چارەگ؛ پاژێ لە چوار پاژ ☰ ١. رُب ٢. یک چهارم؛ چارک

**ڕبات / ř(i)bat/**: ئاوەڵناو. قەپات؛ داخراو؛ بەستراو ☰ بستە؛ مسدود

**ڕبازە / ř(i)baze/**: ناو. ١. ☜ **ڕەپستە** ٢. کاری ئاو دانی زەوی پێش کێڵان ☰ ١. ☜ **ڕەپستە** ٢. آبیاری زمین پیش از کاشت

**ڕباس / ř(i)bas/**: ناو. ڕباسە؛ کەشاو؛ کاری دێرانی زەوی بەر لە چاندن؛ ئاودێری بۆ ئاوەنیا ☰ آبیاری زمین قبل از شخم زدن و کاشتن

**ڕباسە / ř(i)base/**: ☜ **ڕباس**

**ڕبس / řibs/**: ئاوەڵناو. ڕەفس؛ ئاودێریکراو بەر لە کێڵان و چاندن ☰ آبیاری شدە قبل از شخم

**ڕبسان / řibsan/**: چاوگ. ڕەفسان؛ ئاو دران و ئامادە کران بۆ کێڵان ☰ آبیاری شدن و آمادەی شخم گردیدن

**ڕبساندن / řibsandin/**: چاوگ. ڕەفساندن؛ ئاو داشتن و ئامادە کردن بۆ کێڵان ☰ آبیاری کردن و آمادەی شخم گرداندن

**ڕبە / ř(i)be/**: ناو. جۆرێ پێوانەیە بۆ دەخڵ، ئەندازەی نزیک دوو کیلۆیە ‹ڕبە کە پڕ بوو، شەرم لە کەس ناکا «مەسەل»› ☰ نوعی پیمانەی غلە

**ڕبێز / ř(i)bêz/**: ☜ **ڕێواس**

**ڕبێس / ř(i)bês/**: ☜ **ڕێواس**

**ڕپان / ř(i)pan/**: چاوگ. ڕوان؛ سەوز بوونی گیا ☰ روییدن؛ رُستن

**ڕپاندن / ř(i)pandin/**: چاوگ. ڕواندن؛ شین کردن ☰ رویاندن

**ڕپانن / ř(i)panin/**: چاوگ. تەقە و ڕەقە کردن ☰ سروصدا کردن

**ڕپتۆک / řiptok/**: ناو. دۆشاوی یەکجار کوڵێندراوی زۆر خەستەوە بوو ☰ رُب غلیظ

**ڕپشێلە / řipşêle/**: ناو. فێڵ؛ گزی ☰ حیلە

**ڕپلاندن / řiplandin/**: چاوگ. دەورەی دار هەڵپەرتاوتن بۆ بەرز بوونەوەی تاقەبنێک ☰ هَرَس کردن

**ڕپن / řipin/**: ناو. پنج؛ ڕیشە؛ ڕەگ ☰ بُن؛ ریشە

⊡ **ڕپن داقوتان**: ☜ **ڕپن داکوتان**

**ڕپن داکوتان**: ڕپن دان؛ ڕپن داقوتان؛ پنج داکوتان ☰ ریشە دوانیدن

**ڕپن دان**: ☜ **ڕپن داکوتان**

**ڕپنی / řipnî/**: ناو. بارانەی پەڵە ☰ باران کافی برای کشتزار

**ڕپنین / řipnîn/**: چاوگ. پەڵە دان ☰ باریدن باران کافی

**ڕپوڕاست / řip û řast/**: ☜ **ڕەپوڕاست**

**ڕپە / ř(i)pe/**: دەنگەناو. دەنگی تەپەی پا یان بە دار کوتان ☰ صدای پا یا با چوب زدن

**ڕت / ři̇t/**: ناو. ١. نفرە؛ قسەی بێزاری ٢. کاری دەرکردنی نەگەویس ☰ ١. نفرین ٢. دَک

**ڕتاخ / ř(i)tax/**: ناو. سێفەزەمینی؛ یارەڵماسی ☰ سیبزمینی

**ڕتام / ř(i)tam/**: ناو. قووم؛ ڕملی ورد ☰ ریگ

**ڕتان / ř(i)tan/**: چاوگ. ١. نفرە گوتن ٢. وە دەرنران ☰ ١. نفرین گفتن ٢. دک شدن

**ڕتاندن / ř(i)tandin/**: چاوگ. ١. جوێن دان ٢. وە دەرنانی نەگەویس ☰ ١. نفرین کردن ٢. دک کردن

**ڕتل / řitl/**: ناو. گون؛ گونک؛ باتوو ☰ خایە

**ڕتلۆ / řitlo/**: ناوەڵناو. گونهەڵمساو؛ گونپەنەماو؛ گونشۆڕ؛ باتوو باکردوو ☰ فتقی

**ڕتم / řitm/**: ناو. بەرگر؛ لەمپەر ☰ مانع

**ڕتماندن / řitmandin/**: چاوگ. پڕ کردن ☰ انباشتن

**ڕتمی / řitmî/**: ناوەڵناو. بەرگیراو ☰ مسدود

**ڕتمین / řitmîn/**: چاوگ. پڕ بوون ☰ پُر شدن

**ڕتۆپی / ř(i)topî/**: ☜ **ڕێوی**[١]-١

**ڕتو / ř(i)tû/**: ناو. کردە؛ کردار ☰ رفتار

**ڕجا / ř(i)ca/**: ناو. تکا؛ لالە؛ خوایشت ☰ خواهش؛ التماس

⊡ **ڕجا کردن**: لالانەوە؛ تکا کردن ☰ خواهش کردن

**ڕجڕج / řicřic/**: ناو. پەڵەی شین لە پێست لە کەوتن و لێدانەوە ☰ کبودی (پوست)

**ڕجڕجان / řicř(i)can/**: چاوگ. ڕجڕجین؛ ڕجڕجیان؛ شین بوونەوەی پێست لە وێکەوتنەوە ‹مستێکی لە سەر و چاوی دا، لاچاوی ڕجڕجا› ☰ کبود شدن پوست بر اثر ضربه

**ڕجڕجاندن / řicř(i)candin/**: چاوگ. هاڕین ☰ خُرد کردن

**ڕجڕجیان / řičřicyan/**: ☜ **ڕجڕجان**

**ڕجڕجین / řicř(i)cîn/**: ☜ **ڕجڕجان**

**ڕجوا / řicwa/**: ناوەڵناو. ڕەجوا؛ ڕەوا؛ شیاو ☰ روا

⊡ **ڕجوا دین/ دیتن**: ڕەوا دیتن؛ دڵ پێڕازی بوون ☰ روا دیدن

**ڕچە / ř(i)ce/**: ناو. ١. تەنافی جلکان ٢. بەنی شاوڵی بەنا ☰ ١. طناب لباس ٢. نخ شاغول

**ڕچ / řiç/**: ناو. ڕەچ: ١. بەستەڵەک؛ زەویی وشکهەڵاتوو لە سەرمان ٢. ڕەوتی مەیین؛ گرسان؛ گرسیان؛ توند بوونی شتی تراو ٣. ڕێگەی باریک ‹پارانەوەکەم ڕچێکی زانی/ لەو ڕێگەوە گەیمە کامرانی «هەژار، مەم و زین»› ٤. ددانی لێو لە سەر هەڵماڵدراو ☰ ١. یخبندان ٢. انعقاد مایعات ٣. راه باریک ٤. حالت بیرون زدن دندانهای پیش

**ڕچان / ř(i)çan/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //ڕچای؛ دەڕچێی؛ بڕچێ// ڕچیان؛ ڕچین؛ ڕچیای: ١. بەستنی سەهۆڵ ٢. مەیین؛ گرسان ٣. *[کنایە]* لە سەرمادا تەزین ☰ ١. یخ بستن ٢. منعقد شدن ٣. یخ کردن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ڕچاو/ چاوگی نەرێنی: نەڕچان

**ڕچاندن / ř(i)çandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //ڕچاندت؛ دەڕچێنی؛ بڕچێنە// ١. مەیاندن ٢. کردنە سەهۆڵ ☰ ١. مُنعقد کردن ٢. مُنجمد کردن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: -/ چاوگی نەرێنی: نەڕچاندن

**ڕچاو / ř(i)çaw/**: ناوەڵناو. ڕچیاگ؛ ڕچیو؛ ڕەچسە: ١. بەستوو ٢. مەییو ٣. *[کنایە]* تەزیو لە سەرمان ☰ ١. یخبستە ٢. منعقدشدە ٣. یخکردە

**ڕچقاوە / řiçqawe/**: ☜ **ڕیۆق**

**ڕچە / ř(i)çe/**: ناو. ١. ڕێچ؛ ڕێچک؛ ڕێچکە؛ بزنەڕێ؛ کوێرەڕێ؛ ڕێگەی زۆر باریک ٢. بەفری بە سەر یەکدا باریوی ڕچاو لە دەشت و کێودا ☰ ١. کورەراە ٢. برف برهم انباشتەی یخ بستە

⊡ **ڕچە شکاندن**: ڕچە قوتان؛ ڕچە کردنەوە؛ ڕچە کوتان؛ ڕچە کوتانن: ١. بەفر بە پا کوتان بۆ ڕێگە کردنەوە ٢. *[کنایە]* کردنی کارێ کە

کەس نـەیکردبێ ☰ ١. راه در بـرف گشـودن ٢. انجام دادن کاری خارج از تـوان دیگـران یـا بـرای اولین بار

**ڕچە قوتان:** ☜ ڕچە شکاندن

**ڕچە کوتان:** ☜ ڕچە شکاندن

**ڕچە کوتانن:** ☜ ڕچە شکاندن

**ڕچیاگ** / ř̄içyag/: ☜ ڕچاو

**ڕچیان** / ř̄içyan/: ☜ ڕچان

**ڕچیای** / ř̄içyay/: ☜ ڕچان

**ڕچین** / ř̄(i)çîn/: ☜ ڕچان

**ڕچیو** / ř̄(i)çîw/: ☜ ڕچاو

**ڕح** / ř̄iĥ/: ☜ ڕۆح

**ڕحان** / ř̄(i)ĥan/: ☜ ڕێحان

**ڕخ** / ř̄ix/: ناو. ترس؛ سام ☰ ترس

**ڕخانن** / ř̄(i)xanin/: ☜ ڕوخاندن

**ڕخنە** / ř̄ixne/: نـاو. ڕغنە: ١. تانـە و سـەرکۆنە ٢. بەزاڤیت؛ بەژاقـیت؛ کـاری پیشـان دانی چاکـە و خراپەی شت، بابەت یان کەسێ ‹ڕخنەی ئەدەبی› ٣. کاری عەیب گرتن ☰ ١. سرزنش ٢. نقد ٣. ایراد

▣ **ڕخنـە (لـێ) گـرتن:** ١. هەڵسـەنگاندن و پیشـاندانی کـەموکـووڕی (بەرهـەمێ) بـۆ چاکسازی ٢. کاری گـەڕان لـە دووی عـەیبی ڕاستەقینە یان خەیاڵـی، پتـر بـۆ داشـکاندنی بایەخ و بایی کەسێ یا شتێ ‹ وتی: هەی نەفام! دەمی خۆت بگـرە!/ ڕخنـە لـە سیمای شـاعیران مەگرە! «قـانع»› ☰ ١. نقـد کـردن ٢. عیبجـویی کردن

**ڕخنە لێ دان:** پیشـانـدانی کـەموکـووڕی بـە مەبەستی تانە و سەرکۆنە ☰ ایراد گرفتن

**ڕخنەگر** / ř̄ixnegir/: نـاو. ١. ڕغنـەگر ‹ڕخنـەگری سینەما› ٢. عەیب لە شت گـر ‹لـەوی حەسـوود و جەهوولن، لەئیم و ڕخنەگرن/ لـە عـەیب و ڕخنـەیی عالەم بەری دەبن ئودەبا «حاجی قادر»› ☰ ١. مُنتقد ٢. ایرادگیر

**ڕخو** / ř̄(i)xû/: ناوەڵناو. [پلار] ترسنەۆک؛ کەلـەزات ☰ ترسو

**ڕخیان** / ř̄ixyan/: ☜ ڕوخان

**ڕداڵ** / ř̄idał/: ناو. [پلار] تەڕپیر؛ پیری چـاوحیز ☰ پیر هوسباز

**ڕدۆز** / ř̄(i)doz/: ☜ ڕوز

**ڕدین** / ř̄(i)dîn/: ☜ ڕدێن

**ڕدێن** / ř̄(i)dên/: ناو. ڕدین؛ ڕندێن؛ ئەڕدێن؛ ڕیش؛ ڕندۆڵ؛ مووی ڕوومەت و زۆرتر چەناگە و ژێر زنج و گوێی پیاو ☰ ریش

**ڕدێندار** / ř̄(i)dêndar/: ☜ ڕیشدار

**ڕدێنزل** / ř̄(i)dênzil/: ☜ ڕیش‌پان

**ڕز** / ř̄iz/: ناو. ١. زنجیری باریک ٢. لە بـەر یـەک چـوویی لـە زۆر مانـەوەدا ٣. زنجـیرە؛ شـریتە؛ ئەوەی لە بیچمی زنجیر بـێ ٤. ڕیـز؛ ڕزن ☰ ١. زنجیر نازک ٢. پوسیدگی ٣. زنجیره ۴. ردیف

▣ **ڕز دایـن:** ڕاهێنـان؛ گـۆچ کـردن؛ متـودان؛ کەسـێک بـە خوویەکـەوە بەسـتن ☰ عـادت دادن

**ڕزان** / ř̄(i)zan/: چـاوگ. تێـپەر. //ڕزای؛ دەڕزێـی؛ برزێ// ڕزیان؛ ڕزین؛ داڕزان؛ داقنان: ١. پەڕتین؛ پرتووکیان؛ پوان؛ پۆسین؛ پەتشان؛ لە بەر یـەک چوون و خرا بوون لە زۆر مانەوە یان لـە تـەڕایی ‹بە جارێ نایە چاڵـی ژیـانی پرسـزاوە/ کـە شـەوقی چەنـدە گـەنجی هـەژاری تیـا ڕزاوە «هـەردی»› ٢. [کینایە] زۆر شەرمەزار بوون ‹نارزی ئاوا سوور ـ سوور درۆ دەکـەی؟!› ☰ ١. پوسـیدن ٢. بسـیار شـرمنده شدن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ڕزاو/ چاوگی نەرێنی: نەڕزان

**ڕزانـدن** / ř̄izandin/: چـاوگ. تێـپەر. //ڕزانـدت؛ دەڕزێـنی؛ برزێنـە// ڕزانـن؛ پوانـدن؛ پرتووکانـدن؛ پۆساندن؛ داڕزاندن؛ پەڕتاندن ☰ پوساندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەڕزاندن
**ڕزانن / řizanin/:** ☜ **ڕزاندن**
**ڕزانەوە / řizanewe/:** چاوگ. دووبارە ڕزان ⯀ باز پوسیدن
**ڕزاو / ř(i)zaw/:** ئاوەڵناو. داڕزاو؛ ڕزی؛ ڕزیاگ؛ ڕزیو: ١. پواو؛ پرتووکاو؛ لەبەریەک چووی پتەوی لێ نەماو ‹تۆکڵ هەڵوەریو، ڕزاو و پواو/ کرمەڕێز و وشک، ئەعزای ساغ نەماو «قانع»› ٢. پلیشاو؛ پلیخاو؛ داپلۆخاو ⯀ ١. پوسیده ٢. لهیده
**ڕزد / řizd/:** ناو. ڕزدە؛ ڕزدی؛ زنجیرەکێو؛ چەند چیا بە پاڵ یەکەوە ⯀ رشته‌کوه
**ڕزدە / řizde/:** ناو. ١. ئاڵقەڕێزی درگا ٢. ☜ **ڕزد** ⯀ ١. حلقه و زنجیر در ٢. ☜ **ڕزد**
**ڕزدی / řizdî/:** ☜ **ڕزد**
**ڕزق / řizq/:** ناو. ڕسق: ١. بانبانک؛ جانەوریکە نێوان سمۆرە و مشک ٢. بژیو؛ ڕۆزی ⯀ ١. جونده‌ای از سمور کوچکتر ٢. روزی
**ڕزک / řizk/:** ناو. خوێنڕێژی؛ ڕەوتی پژانی خوێن ⯀ خونریزی
**ڕزکان / řizkan/:** چاوگ. ڕزکیان؛ ڕسکیان؛ ڕسکین؛ ڕسین؛ لووت پژان ⯀ خون‌دماغ شدن
**ڕزکاندن / řizkandin/:** چاوگ. ڕسکاندن؛ خوێنی لووت بەردان ⯀ خون‌دماغ کردن
**ڕزکیان / řizk(i)yan/:** ☜ **ڕزکان**
**ڕزگ[١] / řizg/:** ناو. ڕیز؛ ڕێز؛ ڕز؛ سەف ⯀ ردیف
**ڕزگ[٢]:** ئاوەڵناو. هەراش؛ زلتر لە هاوزایان ⯀ بالنده‌تر از همزادان
**ڕزگار / řizgar/:** ئاوەڵناو. ئازاد؛ دەرباز ⯀ رستگار
⊡ **ڕزگار بوون:** ١. خەلستن؛ نەجات بوون ٢. بەختەوەر بوون؛ شاد و کامەران بوون ‹‹ئازا و ڕزگار بم شادان و خەندان/ یان زنجیرلەمل لە سووچی زیندان «هەژار، *بۆکوردستان*»› ⯀ ١. نجات یافتن ٢. خوشبخت بودن
**ڕزگاری / řizgarî/:** ناو. ئازادی: ١. دۆخی دەرباز بوون یان دوور بوون لە مەترسی ٢. ڕەوتی گەیشتن بە ئامانج ⯀ ١و٢. رستگاری
**ڕزگاریخواز / řizgarîx(i)waz/:** ئاوەڵناو. ئازادیخواز. هەروەها: **ڕزگاریخوازی** ⯀ آزادیخواه
**ڕزم / řizm/:** ناو. قەوماوی لە ناکاو ⯀ پیشامد غیرمنتظره
**ڕزن / řizn/:** ناو. ١. ڕیز؛ ڕیزە؛ ڕێزە؛ چینە ٢. ڕیز؛ ڕێز ⯀ ١. رده؛ چین (دیوار و ...) ٢. ردیف
**ڕزندی / řiz(i)ndî/:** ناو. لوولە؛ لوولی؛ بۆری؛ بۆریە ⯀ لوله
**ڕزوان / řizwan/:** ناو. بیابان؛ بیاوان ⯀ بیابان
**ڕزوە / řizwe/:** ناو. ١. گیرە؛ ئاڵقەیەک کە سەری زافتەکەی تێدەکەوێ و قفڵەکەی لێ دەخەن ٢. شاشە؛ ددانەی پێاوپێچ (وەک ددانەی پێچ) ⯀ ١و٢. رُزوه؛ رَزه
**ڕزۆک / řiz(i)ok/:** ئاوەڵناو. ڕزەک: ١. کرمۆڵی ڕزیو ٢. شیاوی ڕزین ⯀ ١. کرم‌خورده‌ی لهیده ٢. پوسیدنی
**ڕزەک / ř(i)zek/:** ☜ **ڕزۆک**
**ڕزەڵ / ř(i)zeł/:** ئاوەڵناو. ڕزەڵۆک؛ ڕزیوی بە کار نەهاتوو ⯀ پوسیده‌ی بی‌مصرف
**ڕزەڵۆک / ř(i)zełok/:** ☜ **ڕزەڵ**
**ڕزی / ř(i)zî/:** ☜ **ڕزاو**
**ڕزیاگ / řizyag/:** ☜ **ڕزاو**
**ڕزیان / řizyan/:** ☜ **ڕزان**
**ڕزیانک / řizyanik/:** ناو. ڕازیانە؛ ڕاژانە ⯀ رازیانه
**ڕزیای / řizyay/:** ئاوەڵناو. پلتیک؛ ڕزیو؛ داڕزیاگ ⯀ پوسیده
**ڕزیلە / ř(i)zîle/:** ئاوەڵناو. ڕزیوە؛ پیری بێهێزی پەکەوتە ⯀ فرتوت
**ڕزین / ř(i)zîn/:** ☜ **ڕزان**
**ڕزیو / ř(i)zîw/:** ☜ **ڕزاو**

**رزیوه** / r̂(i)zîwe/: ☜ **رزیله**

▪ **رژ** / r̂ij-/: پاشەوشە. ـ ڕێژ ‹خوێنڕژ› ☰ ـ ریز

**رژان** / r̂(i)jan/: چاوگ. تێنەپەر. //ڕژای؛ دەڕژێی؛ برژێ// ڕژیان؛ لە سەرەوە بۆ خوار بەربوونەوەی تراو یان هەر شتی وردەدەنک ‹بێ فائیدەیە مەنعی من ئێستاکە لە گریان/ بۆ عاشقی بێچارە زوو ئەم ئاوە ڕژاوە! «نالی»› ☰ ریختن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ڕژاو/ چاوگی نەرێنی: نەڕژان

**رژاندن** / r̂(i)jandin/: چاوگ. تێپەر. //ڕژاندت؛ دەڕژێنی؛ بڕژێنە// ڕژانن؛ ڕژتن: ١. بەرەو خوار کردنەوە و بەردانەوەی تراو یان هەر شتی وردەدەنک ٢. داڕشتن؛ ئەرەمتەی؛ بە شێوەی قالب دەرهێنان ‹گەلالەی پەیکەرەکەی ڕژاندووە› ٣. تێکردن؛ خستنە حساب ‹پارەیەکی زۆریان ڕژاندۆتە حیسابی› ٤. پلان داڕشتن؛ بەراورد کردنی کاروبار بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی دیاریکراو ☰ ١. ریختن ٢. ریختن (طرح) ٣. واریز کردن ۴. برنامەریزی کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەڕژاندن

**رژاندنەوە** / r̂(i)jand(i)newe/: چاوگ. دیسان ڕژاندن ☰ بازریختن

**رژانن** / r̂(i)janin/: ☜ **رژاندن**

**رژانەوە** / r̂(i)janewe/: چاوگ. دیسان ڕژانەوە ☰ بازریختە شدن

**رژتن** / r̂ijtin/: ☜ **رژاندن**

**رژد**[1] / r̂ijd/: ناو. ١. هەورازی کوور؛ هەورازێ کە بە دژوار لێی سەر دەکەون ‹چاو بگێرم لە ڕژد و لێژ/ تا برینم ببن سارێژ «هێمن»› ٢. گەشە؛ ڕەوتی گەورە بوون ☰ ١. سربالایی سخت ٢. رُشد

▣ **رژد کردن:** گەشە کردن؛ بالا کردن ☰ رُشد کردن

**رژد**[2]: ئاوەڵناو. ١. چرووک؛ دەس‌قووچاو ‹وەک ڕژد و چنۆک هەرچی بەنرخ و جوانە/ هێنای بە پەلە و گورجێ دە خاکی ڕاکرد «هەژار، *چوارینەکانی خەیام*»› ٢. سەخناخ؛ سەختان؛ ئاستەنگ ٣. بەخوڕ؛ بەتاو؛ خرۆشان ‹ئاوی چێم گەلەکی ڕژدە› ٤. تایبەتمەندی ئامووری کە نووکی گاسنەکەی قیتە و زۆر لە زەمین دەچەقێ ‹گاسنەکەی ماڵە، تۆزێ ڕژدی کە!› ☰ ١. خسیس ٢. دشوارگُذر ٣. خروشان ۴. ویژگی گاوآهنی کە نُک آن بلند شده تا بیشتر در زمین فرورود

**رژدی** / r̂ijdî/: ناو. ١. چرووکی؛ چکووسی؛ چکوودی ٢. دۆخی بەخوڕ بوون ☰ ١. خِسّت ٢. فشار جریان آب

**رژکی** / r̂ijkî/: ناو. جۆرێ هەنجیری کێویلە ☰ نوعی انجیر وحشی

**رژە** / r̂(i)je/: ناو. کرێژی سەر ☰ شورەی سر

**رژەدار** / r̂(i)jedar/: ئاوەڵناو. سەربەکرێژ؛ قرێژ بە سەر ☰ شورەدار (سر)

**رژی** / r̂(i)jî/: ناو. ١. ڕەژێ؛ خەڵووز؛ ڕەژووە؛ کۆمر ٢. چێشتی بێ‌چەوری ٣. خلتەی جگەرە و سەبیلە ٤. سووتاوی بن بەرۆشە ☰ ١. زُغال ٢. آش بدون چربی ٣. رسوب دود سیگار ۴. سوختەی تە دیگ

**رژیاگوپژیاگ** / r̂ijyag û pijyag/: ئاوەڵناو. ڕژاو و تێکدراو ‹ماڵەکەی ڕژیاگوپژیاگ جێ‌هێشت بۆ من!› ☰ درهم‌ریختە و نامرتب

**رژیان** / r̂ijyan/: ☜ **رژان**

**رژیم** / r̂ijîm/: ناو. ڕژێم: ١. دوزەنە (بەتایبەت سیاسی)؛ دام و دەزگای دەسەڵات ‹ڕژیمی کۆماری› ٢. دەوڵەت یان دەسەڵات ‹ڕژیمی لوبنان› ٣. دەسەڵاتێ کە بێوەری لە پشتیوانی خەڵکەکەیە ‹ڕژیمی ئاپارتاید› ٤. پارێز؛ پارێزانە؛ بەرنامەی خواردن بە ڕەچاو کردنی خواردن و نەخواردنی برێ شت ‹ئەمن ڕژیمم هەیە، برینج ناخۆم› ☰ ١تا ۴. رژیم

⊡ **ڕژێم گرتن**: پارێز کردن؛ لە ڕێنامەیەکی تایبەتی بۆ خواردن و نەخواردن چاوبڕین ☰ رژیم گرفتن

**ڕژێم** / řijêm/: ☜ **ڕژیم**

**ڕژێن**[1] / řijên/: ناو. *[پزیشکی]* دژێن؛ خوشخوشک؛ گلانە؛ ئەندام، شانە یان خانەی بەرهەمهێن و دەڵێنەری ماکی کیمیایی تایبەت ‹ڕژێنی هایپۆفیز› ☰ غُدە

• **ڕژێن**[2]: پاشەوشە. بڕژێن ‹فرمێسکڕژێن› ☰ ـ ریز

**ڕس** / řis/: ناو. ١. ڕچ؛ ڕەوتی مەیین؛ توند بوونی تراو ٢. ڕست؛ ڕستک؛ پەتی باریکی هۆنراو ☰ ١. انعقاد ٢. رشته

**ڕساندن** / ř(i)sandin/: چاوگ. پێوە نووساندن ☰ چسباندن

**ڕسای** / ř(i)say/: چاوگ. ڕوان ☰ روییدن

**ڕست** / řist/: ناو. ١. ڕس؛ پەتی باریکی هۆنراو ٢. قەلادەی ملی تاژی ‹گەردەنکەچی تۆم بێ‌کەشش و ڕست و قەلادە/ وا زەن مەبە ناعارف و هەرزە مەرەسێکم «نالی»› ٣. ڕیز؛ ڕزن؛ ڕزگ ‹لە ناو ڕەزانا، لە ناو ڕەزانا/ ئەگەرام بە ناو ڕستی مێوانا «پیرەمێرد»› ٤. داب و دەستوور ٥. یەکەی ژماردنی تەمەنی تاژی ☰ ١. رشته ٢. قلاده ٣. ردیف ٤. سُنت ٥. واحد شمارش سن تازی

**ڕستاق** / řistaq/: ناوەڵناو. بەرانبەر؛ بەرامبەر ☰ برابر

**ڕستک** / řistik/: ناو. ١. ڕس؛ ڕست ٢. ملوانکە ☰ ١. رشته ٢. گردنبند

**ڕستن** / řistin/: چاوگ. تێپەر. //ڕستت؛ دەڕێسی؛ بڕێسە// ڕێسان؛ ڕێستن؛ ڕێسین: ١. بادانی بەن و لۆکە بە تەشی ‹ڕیسی چەند سالەم، تەشی‌ڕێسی زەمان/ پێچەوانەی ڕستووە، چ بکەم ئەمن؟! «ئاوات»› ٢. *[پلار]* چەنەبازی کردن ‹زۆری ڕست. گوتم وا دیارە ئەو کلیشەی دوکاندارە؛ بۆ هەموو مشتەرییەکی دەڵێن ... «هەژار، ێ ـ ێور»› ☰ ١. ریسیدن ٢. رودەدرازی کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەڕستن

**ڕستوران** / řistûran/: ناو. خواردنگە؛ چێشتخانە ☰ رستوران

**ڕستە** / řiste/: ناو. ١. *[ڕێزمان]* هەڤۆک؛ یەکەی وتار کە لە باری واتاوە سەربەخۆیە و لە وشە یان چەند وشەی پێوەندیداری ڕێزمانی پێکهاتووە ٢. پەتی باریکی ملی تاژی و ... ٣. هەڕشتە؛ هەویری بەهارووی باریک‌براوی وشکەوەکراو بۆ چێشت ☰ ١. جملە ٢. رشتەی گردن تازی و ... ٣. رشتەی خوراکی

**ڕستەئاسا** / řiste'asa/: ☜ **سارستە**

**ڕستەتا** / řisteta/: ☜ **سارستە**

**ڕستەی** / řistey/: چاوگ. ڕوان؛ سەوز بوون ☰ سبز شدن؛ رشد کردن

**ڕستی** / řistî/: ناو. ١. بنچینەی خانوو؛ هیم؛ بناخە ٢. عەرزی پتەو ☰ ١. شالودەی بنا ٢. زمین سخت

**ڕسق** / řisq/: ناو. ١. ڕیچاڵ؛ شیرەمەنی؛ هەر چی لە شیر پەیدا دەبێ ٢. ☜ **ڕزق** ☰ ١. فراوردەی شیر ٢. ☜ **رزق**

**ڕسک**[1] / řisk/: ناو. ١. ڕست؛ ڕس؛ پەتی باریکی هۆنراو ٢. ڕەوتی خوێن لووت پژان ☰ ١. رشته ٢. خون‌دماغ

• **ڕسک**[2]: پاشەوشە. ــ ڕوو؛ ڕەوتی سەوز بوون و سەرهەڵدان ‹خۆڕسک› ☰ ـ رو

**ڕسکان** / řiskan/: چاوگ. تێپەر. //ڕسکای؛ دەڕسکێ؛ بڕسکێ// ١. دروست بوونی سروشتی ٢. جۆش خواردنی پەیوەندی دار ٣. ڕوان و هەڵچوون ‹ڕسکابوو دوو نەونەمامی سەرکەش/ ڕاست و شل و شین و ناسک و گەش «هەژار، »› ☰ ١. به طور طبیعی به وجود آمدن ٢. گرفتن پیوند درخت ٣. روییدن و رُشد کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ڕسکاو/ چاوگی نەرێنی:

نەڕسکان

**ڕسکاندن / ř̌iskandin/:** ☜ **ڕزکاندن**

**ڕسکاو / ř̌iskaw/:** ناوەڵناو. ١. دروستبووی سروشتی ٢. پەیوەندی گرساو ☰ ١. (مخلوق) طبیعی ٢. جوش‌خورده (پیوند)

**ڕسکیان / ř̌isk(i)yan/:** ☜ **ڕزکان**

**ڕسکین / riskîn/:** ☜ **ڕزکان**

**ڕسکێن[1] / riskên/:** ناو. ڕیزکێن؛ ڕیزان؛ ڕیزین؛ جۆرێ گەمەی بە وردەبەرد وەک دامە ☰ نوعی بازی با سنگریزه

• **ڕسکێن[2]:** پاشەوشە. ڕشێنەر ☰ رویاننده

**ڕسل / ř̌isł/:** ناو. دۆلاب لە دیواردا ☰ کمد دیواری

**ڕسنای / ř̌isnay/:** چاوگ. ڕواندن ☰ رویاندن

**ڕسوا / ř̌iswa/:** ناوەڵناو. ناوزڕاو؛ ئابڕووتکاو؛ بێ‌ئابڕوو؛ ئابڕوونەماو؛ ترۆ؛ خەنزار؛ نامڤەت؛ لومە؛ لوومە؛ بەدناو؛ ناوزڕیاگ؛ زەنگ‌زڕیای؛ دەهۆڵ‌دڕاو؛ شەرمنەماو؛ حەیاتکاو؛ حەیاچووگ؛ گۆسارتمە؛ ئەرنە؛ تفەڕوو؛ تفتەڕوو ☰ رسوا

**ڕسوایی / ř̌iswayî/:** ناو. ڕیسوایی؛ بێ‌ئابڕوویی؛ ناوزڕاوی؛ دۆخێ کە بە هۆی دژایەتی لەگەڵ بایەخەکانی کۆمەڵگادا دەبێتە هۆی حەیا چوون و ناوخراوی ☰ رسوایی

**ڕسەر / ř̌(i)ser/:** ناوەڵناو. سەر و مل سوور (مەڕ) ☰ سر و گردن سُرخ (گوسفند)

**ڕسەربەڵەک / ř̌(i)serbełek/:** ناوەڵناو. بەڵەکی سەر سپی (مەڕ) ☰ ابلق سر سفید(گوسفند)

**ڕسیان / ř̌isyan/:** چاوگ. ١. ڕچیان؛ مەیین ٢. هەڵدێران؛ بەربوونەوە ٣. گەیشتن؛ پێ‌گەیشتن (میوە و دەغڵ) ☰ ١. مُنعقد شدن ٢. سقوط کردن ٣. رسیدن (میوه و غلّه)

**ڕسین / ř̌(i)sîn/:** چاوگ. ١. ☜ **ڕزکان** ٢. بە پەنا یەکترەوە نووساندن ☰ ١. ☜ **ڕزکان** ٢. بە هەم چسبانیدن

**ڕشان / ř̌(i)şan/:** چاوگ. ڕژان ☰ ریختن

**ڕشاندن / ř̌(i)şandin/:** چاوگ. پرژاندن ☰ پاشیدن

**ڕشانەوە / ř̌(i)şanewe/:** چاوگ. //ڕشایەوە؛ دەڕشێیەوە؛ بڕشێوە// ١. وەڕشان؛ هێنانەوە؛ هەڵهاوردنەوە ٢. سیس بوون و گوڵ وەرینی ناوەختی دار ☰ ١. شکوفه کردن؛ بالا آوردن ٢. پژمُردن و بی‌موقع ریختن شکوفه‌ی درخت

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ڕشاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەڕشانەوە

**ڕشاو / ř̌(i)şaw/:** ☜ **ڕووشاو**

**ڕشاوەوە / ř̌(i)şawewe/:** ناوەڵناو. وەڕشاو ☰ قی‌کرده

**ڕشت / ř̌işt/:** ناو. کاری شت بە شت وەگۆڕین؛ گۆڕینەوە ☰ معاوضه؛ معامله‌ی پایاپای

**ڕشتارە / ř̌iştare/:** ☜ **ڕەگەز**

**ڕشتن / ř̌iştin/:** چاوگ. تێپەڕ. //ڕشتت؛ دەڕێژی؛ بڕێژە// ١. ڕژاندن ‹دزی خانەگی! واجبە کوشتنت/ لەبۆ عیبرەتی غەیرە، خوێن ڕشتنت «نافیع مەزهەر»› ٢. کل دە چاو کێشان ‹ئەحمەدی خانی بۆ گەییشت/ فرچکی کرد و چاوی ڕشت «هەژار، »› ٣. نەخشان ‹هەناسەی لێوی لالەی کێیە وا ڕەنگی بەهاری ڕشت؟/ کە ئەم دنیایە یەکسەر باغە، ئەم سەحرایە ڕەنگینە! «بێخود»› ☰ ١. ریختن ٢. سُرمه به چشم کشیدن ٣. نقش و نگار کشیدن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ڕشتوو/ چاوگی نەرێنی: نەڕشتن

**ڕشتنەوە / ř̌işt(i)newe/:** چاوگ. *[مەجاز]* ڕەژتنەوە؛ ئاژاوە نانەوە و خەڵک بە گژ یەکا دان ☰ فتنه انگیختن

**ڕشتو / ř̌iştû/:** ناوەڵناو. ڕێژراو ‹چاوی ڕشتوو› ☰ سُرمه‌کشیده

**ڕشتە / ř̌işte/:** ناو. ١. هەڕشتە؛ هەرشتە؛ ڕشدە؛

بەرهەمێکی تاڵ ـ تاڵ لە هەویری گەنم، وشکی دەکەنەوە و لە چێشتی دەکەن ٢. ڕستە؛ ڕستک؛ ڕشدە؛ زنجیرەی لە دوای یەک یان کۆمەڵە شتێکی بە هەودا هۆنراو ‹ڕشتەی قۆرەتەن، جە ئەزەل سیان/ نەک واچی بە مێڵ سورمەش تێ نیان «سەیدی»› ٣. بوار؛ بەش؛ پشک؛ بابەت ‹ڕشتەی فیزیک› ⊒ ١تا٣. رشتە

**ڕشتەپڵاو** / řiştep(i)ɫaw/: ناو. پڵاوهەرشتە؛ جۆرێ پڵاو کە هەڕشتە و گۆشت و جاروبار مێوژ و خورمای سوورەوەکراوی تێ دەکەن ⊒ رشتەپلو

**ڕشخەن** / řişxen/: ☜ **ڕیشخەن**

**ڕشدە** / řişde/: ☜ **ڕشتە ـ١و٢**

**ڕشفەت** / řişfet/: ناو. بەرتیل؛ هبوودی؛ ڕشوەت؛ ڕشڤەت؛ پارەک؛ سمێڵچەورانە؛ دەمشیرینی؛ لێفەت؛ پووڵێ کە خاوەن دەسەڵات بۆ جێبەجێ کردنی کارێک بە نارەوا دەیسێنێ ⊒ رشوە

**ڕشڤەت** / řişvet/: ☜ **ڕشفەت**

**ڕشقەن** / řişqen/: ☜ **ڕیشخەن**

**ڕشک** / řişk/: ناو. سپیلک؛ مێتکە؛ مێتوکە؛ کەرا؛ گەرای ئەسپێ ⊒ رشک

**ڕشکاوی** / řişkawî/: ☜ **ڕشکن**

**ڕشکن** / řişkin/: ئاوەڵناو. ڕشکاوی: ١. ڕشکۆ؛ ئەسپێون ٢. *[پلار]* پۆخڵ و ناشیرین ⊒ ١. شپشو ٢. زشت و کثیف

**ڕشکۆ** / řişko/: ☜ **ڕشکن ـ١**

**ڕشکێنە** / řişkêne/: ☜ **ڕەشێنە**

**ڕشوەت** / řişwet/: ☜ **ڕشفەت**

**ڕشیان** / řişyan/: چاوگ. ڕژان ‹یەی ئاوی وەناو مەملەکەت ڕشیاس/ دوروسیش وە تیر نادوروس کوشیاس! «شامی»› ⊒ ریختن

**ڕشێنە** / ř(i)şêne/: ناو. وردە بارانی هێدی و نەرم ‹جەنابی موفتی ئەفەندی! ڕشێنەیەک باران/ لە دڵتی شتەوە نەقشی مەحەببەتی یاران «مەحوی»› ⊒ نم‌نم ریز باران

**ڕغنە** / řiğne/: ☜ **ڕخنە**

**ڕغنەگر** / řiğnegir/: ☜ **ڕخنەگر**

**ڕف** / řif/: ناو. ڕفانک؛ ڕفحە؛ ڕفە؛ ڕەفحە؛ ڕەفە؛ تاقەی زۆپی لە دیوار بۆ شت لە سەر دانان ⊒ رف

**ڕفان** / ř(i)fan/: ☜ **ڕفاندن**

**ڕفانای** / ř(i)fanay/: چاوگ. ڕفاندن ⊒ ربودن

**ڕفاندن** / ř(i)fandin/: چاوگ. تێپەڕ. //ڕفاندت؛ دەڕفێنی؛ بڕفێنە// ڕفانن؛ ڕفین؛ ڕفان؛ فڕاندن؛ پڕ پێدا کردن و بردن ‹موژگانی سییەهـ مەستی وەکوو چاوی «حەبیبە»/ غارەت کە بکەن، دێن و دەچن، ڕۆح بڕفێنن «نالی»› ⊒ ربودن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەڕفاندن

**ڕفانک** / ř(i)fanik/: ☜ **ڕف**

**ڕفانن** / ř(i)fanin/: ☜ **ڕفاندن**

**ڕفانیای** / ř(i)fanyay/: چاوگ. ڕفێنران ⊒ ربوده شدن

**ڕفاو** / ř(i)faw/: ئاوەڵناو. ڕفیاگ؛ ڕفێنراو؛ فڕێندراو ⊒ ربوده شده

**ڕفت** / řift/: ناو. ڕفتە؛ ڕێژنە؛ بارانی بە تەوژم ⊒ رگبار

**ڕفتە** / řifte/: ☜ **ڕفت**

**ڕفحە** / řifĥe/: ☜ **ڕف**

**ڕفسە** / řifse/: ناو. گیایەکە لە تیرەی کەما و بۆڕ ⊒ گیاهی برگ سوزنی

**ڕفۆک** / ř(i)fok/: ناو. چنگوڕک؛ چنگاڵی باڵداری گۆشتخۆر ⊒ چنگال پرندەی شکاری

**ڕفوزە** / ř(i)fûze/: ئاوەڵناو. نەتێدا؛ نەتێو؛ بەدەر؛ دۆخ و چۆناوچۆنی قەبووڵ نەبوون و لە جێی خۆدا مانەوە؛ دەرنەچوون لە وانەدا ⊒ رفوزە

**ڕفە** / ř(i)fe/: ناو. ١. ☜ **ڕف** ٢. دارێکی کون-کونە کە لە حەسیر چنینا بە کاری دەبەن ⊒ ١. ☜ **رف** ٢. چوبی کە در چیدن حصیر بە کار

برند

**ڕفیاگ / řifyag/:** ☜ **ڕفاو**

**ڕفیان / řifyan/:** ☜ **ڕەڤان ـ٢**

**ڕفیق / ř(i)fîq/:** ☜ **ڕەفیق**

**ڕفین / ř(i)fîn/:** چاوگ. ١. ☜ **ڕفاندن** ٢. فڕین؛ باڵ گرتنەوە ≡ ١. ☜ **ڕفاندن** ٢. پریدن

**ڕفیو / ř(i)fîw/:** ئاوەڵناو. فڕیو؛ هەڵفڕیو ≡ پرواز کرده

**ڕفێدە / ř(i)fêde/:** ناو. مادە؛ مایە؛ مادێ؛ نانبەن؛ کەرستەیێ لە کوڵۆش یان شووڵ کە متقالی بە سەردا گیراوە و نانی پێ بە تەندوور یان ساجەوە دەدەن ≡ رفیده

**ڕفێق / ř(i)fêq/:** ☜ **ڕەفیق**

**ڕفێن**[1] **/ ř(i)fên/:** ناو. ١. بڕفێن؛ کەسێ شت دەڕفێنێ ٢. فڕێن؛ کەسێ مەل هەڵدەفڕێنێ ≡ ١. رُباینده ٢. پروازدهنده

• **ڕفێن**[2]: پاشەوشە. ڕفێنەر ‹دلڕفێن› ≡ ـ رُبا

**ڕفێندران / ř(i)fênd(i)ran/:** ☜ **ڕفێتران**

**ڕفێندراو / ř(i)fênd(i)raw/:** ئاوەڵناو. فڕا؛ ڕفیاگ ≡ ربوده شده

**ڕفێنران / ř(i)fênran/:** چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //ڕفێنرای؛ دەڕفێنریی؛ بڕفێنرێ// ڕفێندران؛ وە بەر ڕفان کەوتن و هەڵگیران ≡ ربوده شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ڕفێنراو / چاوگی نەرێنی: نەڕفێنران

**ڕفێنراو / ř(i)fênraw/:** ☜ **ڕفاو**

**ڕفێن ـ ڕفێن / ř(i)fên ř(i)fên/:** ناو. فڕان ـ فڕان؛ بڕفێن ـ بڕفێن؛ دۆخی کەس‌لەکەسی و هەر کەسە بەشی خۆی هەڵگرتن و ڕفاندن ≡ هرج‌ومرج و هر کس به کار خود

**ڕفێنی / ř(i)fênî/:** ناو. سماقی هەرە باش ≡ نوعی سماق ممتاز

**ڕڤین / ř(i)vîn/:** ناو. پێت؛ ڕمی؛ گڕی ئاگر ≡ زبانه‌ی آتش

**ڕق / řiq/:** ناو. ١. تووڕەیی؛ قەڵسی؛ گژ؛ دەرخستنی هەیەجانی بەدیهاتوو لە نارەزایەتی زۆر، لە کەسێ یان شتێ ٢. ڕک؛ قین؛ هەستی کۆنی دژمنایەتی ‹دەس دەنە دەست و وەرن ئەی گەلی ئازا و نەبەز!/ دەرفەتە، ئێستە لە نێو ئێمە نە ڕق ماوە نە قین «ئاوات»› ≡ ١. خشم ٢. کینه

▣ **ڕق خواردنەوە:** تووڕەیی قووت‌دانەوە و دەرنەخستن ≡ خشم فروخوردن

**ڕق گرتن:** تووڕە بوون ≡ به خشم آمدن

**ڕق لێ بوون:** قین لێ بوون؛ لێ بێزار بوون ‹ڕقی لێمە فەلەک ساقی! کەرەم فەرموو ڕەقی بێنە/ ڕقی وشکی لە تۆ نایە ئەمان موتریب لە تۆ نایە «حاجی قادر»› ≡ تنفر داشتن

**ڕق لێ کێشان:** ☜ **ڕق لێ هەڵگرتن**

**ڕق لێ هەڵگرتن:** ڕق لێ کێشان؛ ڕق لە کەسێ گرتنە دڵ ≡ کینه از کسی به دل گرفتن

**ڕق هەستان:** ڕق هەڵسان؛ ڕک هەستان؛ تووڕە بوون ≡ به خشم آمدن

**ڕق هەستاندن:** ڕق هەڵساندن؛ ڕق هەڵستاندن؛ ڕک دابردن؛ تووڕە کردن ≡ به خشم آوردن

**ڕق هەڵسان:** ☜ **ڕق هەستان**

**ڕق هەڵساندن:** ☜ **ڕق هەستاندن**

**ڕق هەڵستاندن:** ☜ **ڕق هەستاندن**

**ڕقی خۆ پێ ڕشتن:** داخی دڵ پێ ڕژاندن ≡ دق دلی خود را خالی کردن

**بە ڕقدا چوون:** تووڕە بوون ‹بە خۆیدا دا وەکوو ورچی بریندار/ بە ڕقدا چوو بە ناهەق خوێنی ڕشتن «هێمن»› ≡ خشمگین شدن؛ از کوره دررفتن

**ڕقئەستور / řiq'estûr/:** ئاوەڵناو. ڕقاوی؛ ڕق‌جوین؛ ڕقدار؛ ڕقن؛ ڕککوو؛ ڕککین؛ ڕکن؛ ڕکۆ؛ ڕکوونی؛ ڕق‌لەسک؛ قین لە دڵێ کە درەنگ ئاشت بێتەوە

≝ کینەتوز

**ڕقات / ř(i)qat/**: ئاوەڵناو. ڕیز؛ لە پاڵ یەک چنراو ≝ ردیف

**ڕقانی / ř(i)qanî/**: ئاوەڵناو. فرەقین؛ ڕکئەستوور ≝ کینەتوز

**ڕقاوی / ř(i)qawî/**: ☜ **ڕقئەستور**

**ڕقبەرقە / řiwber(i)qe/**: ☜ **ڕکەبەرکێ**

**ڕقجوین / řiqc(i)wîn/**: ☜ **ڕقئەستور**

**ڕقدار / řiqdar/**: ☜ **ڕقئەستور**

**ڕقڕقۆک / řiqř(i)qok/**: ناو. جلکی تازەی بە خشەخش ≝ لباس تازەی خش‌خشی

**ڕقلەزک / řiqlezik/**: ☜ **ڕقلەزگ**

**ڕقلەزگ / řiqlezig/**: ئاوەڵناو. ڕقلەزک؛ ڕکلەزک؛ ڕکلەزگ؛ ڕکوونی ≝ کینەتوز

**ڕقلەسک / řiqlesik/**: ☜ **ڕقئەستور**

**ڕقن / řiqin/**: ☜ **ڕقئەستور**

**ڕقە / ř(i)qe/**: ناو. ملە؛ کێبەرکێ؛ ململانێ ≝ رقابت

**ڕقەبەری / ř(i)qeberî/**: ناو. ڕکبەرکێ؛ ڕکبەرکێنە؛ ڕکەبەری؛ بەربەرەکانی تێکەڵ بە دژمنی ≝ رقابت کینەتوزانە

**ڕقهەستاو / řiqhestaw/**: ئاوەڵناو. تووڕەبوو ‹تا لە ژێر ڕەشبەلەکی کیژ و کوڕی ڕقهەستاو/ جەندەکی دوژمنی بەدکارە نەپەستوێن دەگریم «هێمن»› ≝ بە خشم آمده

**ڕک[1] / řik/**: ناو. ١. ڕژد؛ هەورازی سەخت و کووڕ ٢. ڕکە؛ بێرکم؛ بەرکم؛ قەفەس ٣. هەوساری ملی بەرخ و گوێلک بۆ بەستنەوە ٤. ئەستوورایی نێوان دەندە و باسکێش ٥. ڕق؛ تووڕەیی ٦. ڕەگ؛ بن؛ ڕیشە ≝ ١. سربالایی سخت ٢. قفس ٣. رشتەی گردن برّە و گوسالە ٤. ستبری میان گاوآهن و خیش ٥. خشم ٦. ریشە

⊡ **ڕک چوون**: ١. دە ڕقەوە چوون ٢. هێور بوونەوە لە پاش تووڕیی ≝ ١. خشمگین شدن ٢. آرام شدن

**ڕک دابردن**: ☜ **ڕق هەستاندن**

**ڕک کردن**: ١. لە تووڕەیی مان گرتن ٢. سینگ کردن؛ پێ بە زەویدا چەقاندن و مان گرتنی چوارپێ لە ڕۆیشتن ≝ ١. از فرط خشم اعتصاب کردن ٢. حرکت نکردن چهارپا

**ڕک گرتن**: لە ڕقان سوور بوون لە سەر کارێک ≝ اصرار ورزیدن از کینەتوزی

**ڕک هەستان**: ☜ **ڕق هەستان**

**ڕک[2]**: ئاوەڵناو. ڕژد ≝ دشوارگُذر

**ڕکئەستور / řik'estûr/**: ئاوەڵناو. فرەقین؛ ڕقانی ≝ کینەتوز

**ڕکابەر / ř(i)kaber/**: ناو. هومال؛ هاڤڕک؛ هاوملە؛ هەرکام لەو کەسانەی کە پێکەوە کێبەرکێ دەکەن ‹یەکەمی بێڕکابەر› ≝ رقیب

**ڕکابەری / ř(i)kaberî/**: ناو. کێبەرکێ؛ ڕکانێ؛ ملە ≝ رقابت

**ڕکات / ř(i)kat/**: ناو. /ئیسلام/ ڕەکات؛ چەوتە؛ پاژێک لە نوێژ، بریتی لە وەستان، خوێندنی ئایەت و سوورە لە قورئان، دانەوان و سەر نانە زەوی ≝ رکعت

**ڕکاکە / ř(i)kake/**: ناو. تەکمیش؛ کاری بنکۆڵ کردنی داری میوە ≝ عمل گود کردن پای درخت میوە

**ڕکان / ř(i)kan/**: ناو. باوەڕی؛ خاترجەمی لە کەسێک ≝ اعتماد

**ڕکانێ / ř(i)kanê/**: ناو. ملە؛ کێبەرکێ ≝ مُسابقە

**ڕکبەرکێ / řikberkê/**: ☜ **ڕکەبەرکێ**

**ڕکبەڕکێ / řikbeř(i)kê/**: ☜ **ڕقەبەری**

**ڕکبەڕکێنە / řikbeř(i)kêne/**: ☜ **ڕقەبەری**

**ڕکڕکێن / řikř(i)kên/**: دەنگەناو. چیرە ـ چیرەی ددانان ≝ صدای بە هم ساییدن دندان‌ها

**ڕککو / řikkû/:** ☜ **ڕق‌ئەستوور**

**ڕککە / řikke/:** ناو. ڕکە؛ ڕک؛ بێرکم؛ قەفەز ☰ قفس

**ڕککین / řikkîn/:** ☜ **ڕق‌ئەستوور**

**ڕکلەزک / řiklezik/:** ☜ **ڕق‌لەزگ**

**ڕکلەزگ / řiklezig/:** ☜ **ڕق‌لەزگ**

**ڕکن / ř(i)kin/:** ☜ **ڕق‌ئەستوور**

**ڕکۆ / ř(i)ko/:** ☜ **ڕق‌ئەستوور**

**ڕکو / ř(i)kû/:** ناو. چۆنیەتی هەڵلەرزین لە سەرمان یان لە ترسان ☰ حالت لرزیدن از سرما یا ترس

**ڕکوع / ř(i)kû'/:** ناو. *[ئیسلام]* بەشێک لە نوێژ لە هەر ڕکاتدا کە نوێژکەر دادەنەوێ، دەست لە سەر ئەژنۆ، ڕستەیەک لە پەسنی خودا دەڵێ ☰ رکوع

**ڕکونی / ř(i)kûnî/:** ☜ **ڕق‌ئەستوور**

**ڕکە / ř(i)ke/:** ناو. ١. ملە؛ ململانێ؛ کێبەرکێ ٢. بێرکم؛ هەودەک؛ لیسک؛ قەفەس ‹بەهیوان بگرمێنێ هەوری بەهاری/ ڕەها بن لە زیندانی بەردینی غارا/ کەچی، وا کەوی و دەستەمۆی دەستەڵاتی ڕکەی دۆڵ و شیون ... «سوارە»› ٣. هەورازی ڕک ☰ ١. رقابت؛ مسابقه ٢. قفس ٣. سربالایی سخت و تیز

▣ **ڕکە کردن:** ململانێ کردن ‹ئەو دووە ڕکە دەکەن کێ زووتر سەرکەوێ› ☰ رقابت کردن

**ڕکەبەرکێ / ř(i)keberkê/:** ناو. ڕکبەرکێ؛ ڕق‌بەرقە؛ بەرامبەرکێ؛ ملانێ؛ ملە و کێبەرکێ ☰ رقابت

**ڕکەبەری / ř(i)keberî/:** ☜ **ڕقەبەری**

**ڕکەنە / ř(i)kene/:** ناو. دووژ؛ کاری تیخ لە پێست دان بۆ خوێن گرتن ☰ حجامت

**ڕکەوین / ř(i)kewin/:** ئاوەڵناو. *[بلار]* پیشن؛ ڕکن؛ قینەون ☰ کینه‌ای

**ڕکەوەندە / ř(i)kewende/:** ناو. سیامال؛ ڕەشماڵ ☰ سیاه‌چادر

**ڕکهەستاو / řikhestaw/:** ئاوەڵناو. ڕکهەستای؛ ڕکین ☰ کینه‌توز

**ڕکهەستاوی / řikhestawî/:** ناو. ١. گەرووشە؛ گرسی ٢. ڕکینی؛ قینەونی ☰ ١. عصبانیت ٢. کینه‌توزی

**ڕکهەستای / řikhestay/:** ☜ **ڕکهەستاو**

**ڕکهەڵگر / řikhełgir/:** ئاوەڵناو. کینەکێش؛ کینەدار؛ ڕکوونی؛ ڕک لە زگ ☰ کینه‌توز

**ڕکیان / řikyan/:** چاوگ. تووڕە بوون ☰ خشمگین شدن

**ڕکین / ř(i)kîn/:** ئاوەڵناو. ڕکهەستاو ☰ خشمگین

**ڕکێشە / ř(i)kêşe/:** ناو. ڕەکێشە؛ ڕووکێشە؛ ڕێکێشە؛ هەڕکیشە؛ ڕاکیشە؛ هلەگشە؛ زمانەبەرخ؛ گەلادمەڵ؛ گوێ‌بزنە؛ گیادووپشک؛ ئالفە گیایەکی یەکساڵانە بە گەڵای گەورە و چڕ و گوڵی کۆ و هۆشەییەوە کە دەیخەنە سەر برین ☰ بارهنگ

**ڕکێف / ř(i)kêf/:** ناو. ڕکێو؛ ئاوزەنگی؛ زەنگوو ☰ رکاب زین

**ڕکێفدەواڵ / ř(i)kêfdewał/:** ناو. قایشی ئاوزەنگی ☰ تسمه‌ی بند رکاب

**ڕکێفکوت / ř(i)kêfkut/:** ناو. کاری تاو دانی ئەسپ ☰ اسب‌دوانی

**ڕکێو / ř(i)kêw/:** ☜ **ڕکێف**

**ڕم[1] / řim/:** ناو. ڕمب: ١. نیزەی درێژ ٢. دارێکی درێژ و باریکی سافکراو تایبەتی بۆ کاری بەری دار تەکاندن ☰ ١. نیزەی بلند ٢. چوبِ تکاندن درختِ میوه

**ڕم[2]:** دەنگ. دەنگی وێک‌کەوتنی دوو شتی تۆکمە ☰ صدای به‌هم خوردن دو شیء چگال

**ڕماڵ / ř(i)mał/:** ناو. زبڵ و زاڵ ☰ آت و آشغال

**ڕمان / ř(i)man/:** چاوگ. تێنەپەڕ. //ڕمای؛ دەڕمێی؛

بـڕمێ// ڕمیـان؛ ڕمـین؛ هەرەڤـان: ١. هـەڕفتن؛ تێک‌تەپان؛ ڕووخان ‹پـڕ عیشـوە بچەرخێنـە، ئیتـر هیچ مەبە دەربەست:/ چەن ماڵ ئەڕمێ، چـەن شـل ئـەبێ هێـزی دڵ و دەسـت! «گـۆران»› ٢. *[کینایە]* کەوتن؛ کەفتن ☰ ١. فروریختن ٢. افتادن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ڕماو/ چاوگی نەرێنی: نەڕمان

**ڕمانـدن** / ř(i)mandin/: چـاوگ. تێـەڕ. //ڕمانـدت؛ دەڕمـێنی؛ بڕمێنـە// ڕمـانن؛ هەرەڤـین: ١. تێک‌تەپانن؛ ڕووخاندن ٢. خسـتن؛ بوونـە هـۆی کەوتن ‹پام دا بەر پای ڕماندم› ☰ ١. ویـران کـردن ٢. انداختن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ــ/ چاوگی نەرێنی: نەڕماندن

**ڕمانن** / ř(i)manin/: ☜ **ڕماندن**

**ڕمانە** / ř(i)mane/: نـاو. جۆرێ داسـی دروێنـە ☰ نوعی داس

**ڕماو** / ř(i)maw/: ئاوەڵناو. ڕووخاو؛ ڕمیاگ؛ ڕمیـاو؛ تێک‌تەپیو ☰ ویران‌شده

**ڕمـای** / ř(i)may/: چـاوگ. ڕمـان؛ ڕمیـان ☰ فروریختن

**ڕمب**[1] / řimb/: ناو. ڕم؛ نێزەی درێژ ☰ نیزەی بلند

**ڕمب**[2]: دەنگەناو. ڕمە؛ ڕمبە؛ دەنگی داکەوتنی شتی نەرمی زل ☰ صدای افتادن شیئ سنگین و نرم

**ڕمباز** / řimbaz/: ناو. کەسـێ کـە لـە ڕم بـە کـار هێناندا چێیە ☰ نیزەباز ماهر

**ڕمبـازی** / řimbazî/: نـاو. ١. شـەڕ بـە نێـزە ٢. هات‌وچووی ئەسپ یان سوار لـە مەیدانـدا ‹بێتـە سەر ڕەوتی کومەیتی بـەیتی خـۆش تـەعلیمی مـن/ هـەر کەسـێ وا ئەسـپی تـەبعی فێـرە ڕمبـازی ئـەکا «ناری»› ٣. ☜ **زرمەزلێ** ☰ ١. جنـگ بـا نیـزە ٢. جولان سوار در میدان ٣. ☜ **زرمەزلێ**

**ڕمبازێن** / řimbazên/: نـاو. کاری هەڵـبەز ـ دابـەز کردن و هـەڵاتن ☰ عمـل بـالا و پـایین پریـدن و دویدن

**ڕمبە** / řimbe/: دەنگەناو. ١. ☜ **ڕمب**[2] ٢. دەنگـی دەهۆڵ ☰ ١. ☜ **ڕمب**[2] ٢. صدای دُهُل

⊡ **ڕمبە هاتن**: *[مەجاز]* کـەیفخۆش بـوون ‹هێنـدە سازم هەر ڕمبەم دێ› ☰ شاد و خُرّم بودن

**ڕمبیژ** / řimbîj/: ☜ **ڕەوەنپێژ**

**ڕمبیشک** / řimbîşk/: نـاو. تـاوەی بچـووکی بـە دەسک لە چەند لاوە ☰ تابەی کوچک دستەدار

**ڕمبێز** / řimbêz/: ☜ **ڕێواس**

**ڕمپێشک** / řimpêşk/: ☜ **ڕەوەنپێژ**

**ڕمژوە** / řimj(i)we/: ئاوەڵناو. زۆر تاڵ ☰ بسیار تلخ

**ڕمڵ** / řim(i)ł/: نـاو. ١. تـەم لـە سـەر چـەم؛ ڕەشکەوپێشکە ٢. چەو؛ زیخی وردی وەک تۆز لە بیابان ☰ ١. تیرگی چشم ٢. ریزگَرد

⊡ **چاو ڕمڵ کردن**: ڕەشکە و پێشکە کردن؛ بەرچاو تاریک بوون ☰ چشم سیاهی رفتن

**ڕمنای** / řimnay/: چاوگ. ڕماندن ☰ ویران کردن

**ڕموەشێن** / řimweşên/: ناو. ڕمهاوێژ؛ کەسێ کە لە شەڕدا کاری ڕم خستنە ‹چەن پاڵەوانان کلاوخـود لە سەر/ چەن ڕمەوەشێنان چەن دەست بە خەنجـەر «قانع»› ☰ نیزەانداز

**ڕموودە** / ř(i)mûde/: ئاوەڵناو. ئاڵوودە؛ هۆگر؛ ئـۆگر؛ خووپێ‌گرتوو ☰ خوگرفته

**ڕموزن** / ř(i)mûzin/: نـاو. مێردەزمـە؛ دێوەزمـە؛ ڕەمووزن؛ ڕمووزین؛ بوونەوەری خەیاڵی، بەدفەڕ و مرۆترسێن ‹بوومە گەپچاڕ و دەکا گاڵـتەی بـە مـن/ ئەو ڕمووزنەی زەندەقی چووبوو لە من «هـێمن»› ☰ دیو

**ڕموزین** / ř(i)mûzîn/: ☜ **ڕموزن**

**ڕموسک** / ř(i)mûsik/: نـاو. ڕیمۆسـک؛ مۆسـک؛ گیایەکە لـە مێرگـدا شـین دەبـێ و لاسـقەکەی دەخورێ ☰ گیاهی است

**ڕمە** / ř(i)me/: ☜ **ڕمب**[2]

**ڕمهاوێژ** / řimhawêj/: ☜ **ڕموەشێن**

**ڕمهەرکێر / ȓimherkêr/**: ناو. بەراز؛ یەکانە 🕮 گُراز نر

**ڕمی / ȓ(i)mî/**: ☜ ڕڤین

**ڕمیاگ / ȓimyag/**: ☜ ڕماو

**ڕمیان / ȓimyan/**: ☜ ڕمان

**ڕمیاو / ȓimyaw/**: ☜ ڕماو

**ڕمین / ȓimîn/**: ☜ ڕمان

**ڕمێز / ȓm(i)êz/**: ☜ ڕێواس

**ڕمێن[1] / ȓ(i)mên/**: ناو. برەو؛ برەو؛ ڕەواج 🕮 رواج

◘ **لە ڕمێن کەوتن**: برەو نەمان؛ لە برەو کـەوتن 🕮 از رونق افتادن

▪ **ڕمێن[2]**: پاشەوشە. ئەوەی دەڕمێنێ ‹بـانڕمـێن› 🕮 ویران‌کننده

▬ **ڕن / ȓin-/**: پاشەوشە. ١. ـ هەڵـکەن؛ ـ هەڵـقەن ‹بیسـتانڕن؛ مـووڕن› ٢. ـ ڕووکـێن؛ ـ ڕووشـێن ‹ڕووڕن› ٣. ـ ڕێـژ؛ ـ ڕژ ‹بـاڕن› 🕮 ١. ـ بـرچین؛ ـ برکن ٢. ـ خراش ٣. ـ ریز

**ڕنـان / ȓ(i)nan/**: چـاوگ. تێنەپەڕ. //ڕنـای؛ دەڕنێـی؛ بڕنێ// ١. هەڵکەندران ٢. کران؛ هەڵکڕدران 🕮 ١. کنده شدن ٢. خراش برداشتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ڕناو/ چاوگی نەرێنی: نەڕنان

**ڕنـاو / ȓ(i)naw/**: ئاوەڵـناو. ڕنیـاگ: ١. چنـراوە بـە دەست ٢. ڕووشاو؛ بە نینۆک زامـارکراو ٣. کـڕاو؛ هەڵکەنراو 🕮 ١. چیده شده با دست ٢. خراشـیده بـا ناخن ٣. حک‌شده

**ڕنای / ȓ(i)nay/**: چاوگ. دراندن 🕮 پاره کردن

**ڕند / ȓind/**: ئاوەڵناو. ١. بـاش؛ پەسـند ٢. جـوان؛ خوشیک؛ خۆشکۆک 🕮 ١. نیکو ٢. زیبا

**ڕندران / ȓind(i)ran/**: ☜ ڕنران

**ڕندراو / ȓind(i)raw/**: ئاوەڵـناو. کڕاو؛ کراوە؛ کڕیاگ 🕮 حک شده

**ڕندک / ȓindik/**: ☜ ڕۆندك

**ڕندوکرێت / ȓind û k(i)rêt/**: ئاوەڵناو. پـاک‌وپـیس؛ چاک‌وخراپ؛ خاس‌وخراو 🕮 نیک و بد

**ڕنـدۆڵ / ȓindoł/**: نـاو. ١. ☜ ڕدێـن ٢. کەنـدڕ؛ ئاودڕ 🕮 ١. ☜ ڕدین ٢. آبکند

**ڕندو / ȓindû/**: ناو. ڕنوو؛ ڕنی؛ ڕەنی؛ ڕەنۆ؛ ڕەنـوو؛ کلێڵـە؛ کـەوی؛ سـلخە؛ ئاشـویت؛ کەویەبـەفر؛ کۆمایەکی بەفر کە زۆرتر با ڕنیویە و لە سەر یەک کۆ بۆتەوە 🕮 توده برف باد انباشته

**ڕندی / rindî/**: نـاو. ١. چـاکی؛ خاسـی؛ باشـی ٢. جوان‌چاکی 🕮 ١. خوبی ٢. خوشکلی

**ڕندێن / rindên/**: ☜ ڕدین

**ڕنـران / ȓinran/**: چـاوگ. تێنەپـەڕ. نادیـار. //ڕنـرای؛ دەڕنرێی؛ بڕنرێ// ڕندران؛ ڕنیان 🕮 برچیده شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ڕنراو/ چاوگی نەرێنی: نەڕنران

**ڕنرانەوە / ȓinranewe/**: چاوگ. پرتکین؛ پرچکان؛ پرچکین 🕮 درو شدن

**ڕنـک / ȓink/**: نـاو. لاسـکە کـەنگری ناسـک کـە دەخورێ 🕮 ساقەی نازک کنگر سبز

**ڕنکە / ȓinke/**: ناو. ڕنگە؛ ڕەندە؛ ئـامرازی دارتـاش کە داری پێ لووس دەکەن 🕮 رنده

**ڕنگ[1] / ȓing/**: نـاو. ڕنگاڵ؛ ڕینـگ؛ ڕینگـاڵ؛ ڕیـاڵ؛ ڕیواڵ: ١. هەنگوین و دۆشاوی پاڵێوراو ٢. ڕەواقی هەنگوین 🕮 ١. پالودەی شیره و عسل ٢. عسل مُصفا

**ڕنگ[2]**: دەنگەناو. ڕینـگ: ڕنگە؛ دەنگی کەوتنی شتی قورسـی ڕەق 🕮 صـدای افتـادن جسـم سـخت و سنگین

**ڕنگاڵ / ȓingał/**: ☜ ڕنگ[1]

**ڕنگان / ȓingan/**: چاوگ. ١. پالاوتنی دۆشـاو یـان هەنگوین ٢. *[مەجاز]* قسەی بـێ‌تـام کـردن 🕮 ١. پالودن شیره یا عسل ٢. یاوه گفتن

**ڕنگاندن / ȓingandin/**: ☜ ڕنگانەوە

**ڕنگانـەوە / ȓinganewe/**: چـاوگ. ڕنگانـدن؛ ڕینگاندنـەوە؛ ڕینگانـەوە؛ چەنـەبازی کـردن و دووپاتە کردنەوەی قسـەی بـێ‌تـام 🕮 ژاژخـایی

کردن

**ڕنگاو / ȓingaw/**: ناو. ڕەنگاو؛ سرکەی هێشووە ترێ تێ خراو ▣ سرکەی محتوی خوشه انگور

**ڕنگنای / ȓing(i)nay/**: چاوگ. ڕنگاندن ▣ ژاژخایی کردن

**ڕنگە¹ / ȓinge/**: ☜ ڕنکە

**ڕنگە²**: ☜ ڕنگ²

**ڕنگین / ringîn/**: چاوگ. ڕنگە لێ هاتن لە کەوتندا ▣ صدا دادن جسم سنگین سخت در اثر افتادن

**ڕننە / rinne/**: ☜ ڕەندە

**ڕنو / r(i)nû/**: ناو. ڕەنوو؛ ڕندوو؛ ڕەنۆ؛ ڕنی؛ ڕەنی؛ کلێلە؛ کەوی؛ سلخە؛ ئاشویت؛ کەویەبەفر؛ کۆمایەکی بەفر کە زۆرتر با ڕنیویە و لە سەر یەک کۆ بۆتەوە ▣ توده برف باد انباشته

**ڕنە / ȓ(i)ne/**: ناو. ١. کاری چنینی میوە ٢. وەختی چنینی میوە ٣. وردەبارانێ کە ڕەشماڵ دایئەدا ٤. درمغ؛ خەپە؛ دارێکی بەددانە، کلۆشی پێ کۆ دەکەنەوە ٥. کاری دروونی گوڵی مەرەزە ٦. ڕەن؛ هێلێک لە گیای دووراو لە مەزرایەکدا ٧. حەیاز؛ حەیاس؛ چۆ؛ چەق؛ ناخوونی دیاری دان و بەراورد کردنی تەمەنی کەڵەشێر ٨. ☜ ڕەندە ▣ ١. عمل چیدن میوه ٢. موسم چیدن میوه ٣. نم‌نم بارانی که از سیاه چادر می‌تراود ۴. از ابزار کشاورزی ۵. کار بریدن خوشه‌های شالی ۶. خطی از بسته‌های گیاه درو شده ۷. ناخن خنجر مانند پای خروس ٨. ☜ ڕەندە

**ڕنەک / ȓ(i)nek/**: ناو. ١. بڕبەند؛ بڕوەن ٢. قەشەو؛ ئاسنێکی پڕ بە دەستی ددانەدارە، ولاغی پێ دەخورێنن ▣ ١. سوهان ٢. قشو

**ڕنی / ȓ(i)nî/**: ☜ ڕندوو

**ڕنیاگ / ȓinyag/**: ☜ ڕناو

**ڕنیان / ȓinyan/**: ☜ ڕنران

**ڕنیای / ȓinyay/**: ☜ ڕنین

**ڕنین / ȓ(i)nîn/**: چاوگ. تێپەڕ. //ڕنیت؛ دەڕنی؛ بڕنە// ڕنیای: ١. چنینەوە بە دەست ‹ئەو هەوەسبازانە جێی متمانە نین/ هەر دەزانن گوڵ چنین و بەی ڕنین «هێمن»› ٢. چڕنووک لێدان ٣. کڕاندن ▣ ١. چیدن ٢. خراشیدن ٣. حک کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەڕنین

**ڕنینەوە / ȓ(i)nînewe/**: چاوگ. ١. دوورین؛ دروون ٢. بە دەست هەڵکەندن ‹قژی ڕنییەوە دای لە سینگی خۆی/ بەرۆکی دڕی قوڕی پێوا بۆی «هێمن»› ٣. ڕووکانن؛ ڕووشاندن ▣ ١. درو کردن ٢. کندن ٣. خراشیدن

**ڕنیەی / ȓinyay/**: چاوگ. ڕزگار کردن ▣ نجات دادن

**ڕوا / ȓ(i)wa/**: ناو. ١. ☜ ڕێوی¹ـ١ ٢. ڕیا؛ ڕیایی؛ ڕووبینی؛ کار و کردەوەی درۆینە نواندن بۆ لاباندنی کەسانی تر ▣ ١. ☜ ڕێوی¹ـ١ ٢. ریا

**ڕواباز / ȓ(i)wabaz/**: ئاوەڵناو. دووڕوو ▣ ریاکار

**ڕوابازی / ȓ(i)wabazî/**: ☜ ڕوبازی

**ڕوار¹ / ȓ(i)war/**: ناو. چۆم؛ چەم؛ ڕووبار ▣ رود

**ڕوار²**: ☜ ڕودار-٣

**ڕواس / ȓ(i)was/**: ☜ ڕێوی¹ـ١

**ڕواسە / ȓ(i)wase/**: ☜ ڕێوی¹ـ١

**ڕواکان / ȓ(i)wakan/**: چاوگ. دزین؛ ڕواکانن ▣ دزدیدن

**ڕواکانن / ȓ(i)wakanin/**: چاوگ. دزین؛ چڕپانن؛ شتێک بە نهێنی بۆ خۆ بردن ▣ دُزدیدن

**ڕواڵ¹ / ȓ(i)wał/**: ناو. ڕەواڵ: ١. لای بەرچاو ٢. تەنشت؛ تەنیشت؛ پاڵ ▣ ١. روی ٢. کنار

**ڕواڵ²**: ئاوەڵناو. ڕەواڵ؛ تازەجوان؛ موو لێنەهاتوو ▣ سادەرو

**ڕواڵەت / ȓ(i)wałet/**: ناو. ١. دیمەن؛ ئەوەی لە بەر چاوە ‹بە ڕواڵەت چەن پرشنگدار و شیک بوو/ پێچەوانەی ئەوە، دڵی تاریک بوو! «گۆران»› ٢. دیم؛

دەم و چاو ٣. ڕوا؛ ڕیایی ▣ ١. ظاهر ٢. چهره ٣. ریا

**ڕواڵەتباز** / ř(i)wałetbaz/: ئاوەڵناو. ڕووبین؛ ڕیاباز؛ ڕیاکار ▣ ریاکار

**ڕواڵەتبین** / ř(i)wałetbîn/: ئاوەڵناو. سەرسەری؛ سەرسەرەکی؛ سەرچڵ ▣ سرسری؛ ظاهربین

**ڕواڵەتدار** / ř(i)wałetdar/: ئاوەڵناو. بەڕەنگ‌وڕوو؛ جوان و لەبار ▣ زیباروی

**ڕواڵەتسازی** / ř(i)wałetsazî/: ☜ **ڕواڵەتی**

**ڕواڵەتکاری** / ř(i)wałetkarî/: ☜ **ڕواڵەتی**

**ڕواڵەتی** / ř(i)wałetî/: ئاوەڵناو. ١. فۆرمالیتە؛ مەجازی؛ تەشریفاتی ٢. دیار و بەرچاو ▣ ١. فُرمالیته ٢. ظاهری

**ڕوان**[١] / ř(i)wan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //ڕوای؛ دەڕوێی؛ بڕوێ// ١. شین/ سەوز بوون ٢. پێکەوە لکان و جووت بوونی گەماڵ و دەڵ ▣ ١. روییدن ٢. جفتگیری کردن سگ

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ڕواو/ چاوگی نەرێنی: نەڕوان

• **ڕوان**[٢]: پاشوشە. ـ نواڕ ‹چاوەڕوان› ▣ ـ نگر

**ڕواندن** / ř(i)wandin/: چاوگ. تێپەڕ. //ڕواندت؛ دەڕوێنی؛ بڕوێنە// ١. سەوز/ شین کردن ٢. جێبەجێ کردن ٣. وەدەرنان ▣ ١. رویاندن ٢. انجام دادن ٣. راندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەڕواندن

**ڕوانگە** / ř(i)wange/: ناو. ١. جێگەیەک کە لێیەوە دەڕوانن ‹ئەم دەستەشی بردەوە دەمەوجار/ دیتی لە ڕوانگە بەکری شۆڤار «هەژار، *مەموزین*»› ٢. بۆچوون؛ شێوەی داوەری و تێفکرین سەبارەت بە بابەتێ ‹ڕوانگەی ولاتانی هاوسێ سەبارەت بە دۆزی کورد› ▣ ١. محل دیدبانی ٢. دیدگاه

**ڕوانە** / ř(i)wane/: ئاوەڵناو. ناردراو؛ بەڕێ کراو ▣ روانه

⊡ **ڕوانە کردن**: ١. خستنە ڕێ ٢. لە کاتی ڕۆیشتنی کەسێک، چەند هەنگاو لەگەڵیدا چوون ‹میوانەکانم تا بەر درگا ڕوانە کرد› ▣ ١. راهی کردن ٢. مُشایعت/ بدرقه کردن

**ڕوانەوە** / ř(i)wanewe/: چاوگ. ١. توند بوونەوەی دۆشاو یان هەرچی لە بەر زۆر مانەوە ٢. سەوز بوونەوە ‹مێرگەکە ڕواوەتەوە› ▣ ١. غلیظ شدن از زیاد ماندن ٢. باز روییدن

**ڕوانین** / ř(i)wanîn/: چاوگ. تێنەپەڕ. //ڕوانیت؛ دەڕوانی؛ بڕوانە// ڕۆنین؛ تماشا کردن ‹مەڕوانەرە ئەمڕۆ، کە بە ڕوومەت گوڵی تاکی/ بڕوانە سبەینێ کە لە ناو دامەنی خاکی! «هەردی»› ▣ نگاه کردن؛ نگریستن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەڕوانین

**ڕواو** / ř(i)waw/: ئاوەڵناو. سەوزبوو؛ شینبوو ▣ روییده

**ڕواوە** / ř(i)wawe/: ئاوەڵناو. خەستەوەبوو لە بەر مانەوەی زۆر ▣ غلیظ شده از زیاد ماندن

**ڕوایڕۆ** / ř(i)wayřo/: ناو. شەپۆڕ؛ شیوەن؛ شین؛ چەمەرە؛ چەمبەرە؛ بانگ؛ ڕۆ ـ ڕۆ؛ شین و گریان بە دەنگی بەرز، بۆ شینگێڕی ▣ شیون

**ڕوب** / řub/: ☜ **ڕب**

**ڕوباب** / řubab/: ☜ **ڕوبابە**

**ڕوبابە** / řubabe/: ناو. ڕوباب؛ شاشەک؛ سازێکی کۆن بە بیچم وەک تار ▣ رباب

**ڕوبات** / řubat/: ناو. ١. ڕەبەت؛ بۆسەی ڕاوکەر ٢. حەشارگەی کەو ▣ ١. کمین شکارچی ٢. کمینگاه کبک شکاری

**ڕوبوت** / řubut/: ناو. ئامێر یان مەکینەیەکی خۆمەش بە توانای جێبەجێ کردنی بڕێ کاری مرۆوە ▣ رُبات

**ڕوپ** / řup/: ئاوەڵناو. تفت؛ گیر؛ گیڕ ▣ گَس

**ڕوتوش** / řutûş/: ناو. کاری پەرداخ و جوان کردن؛ کاری دەست لێ دان و جوان کردنی فیلم و وێنە ‹وێنەکەیان ڕوتووش کردووە، دەنا بۆ خۆی جوان

نییە› ≡ روتوش

**ڕوتیق** / řutîq/: ناو. ڕیخ؛ ڕیقنە؛ ڕیقنە؛ جیقنە؛ پیسی پەلەوەر ≡ پیخال؛ فضلەی پرندگان

**ڕوچکان** / řuçkan/: چاوگ. ڕووتانەوەی مەل لە پەڕ و پۆ ≡ پر پرنده ریختن

**ڕوح** / řuĥ/: ☜ **ڕۆح**

⊡ **ڕوح چوون**: [کینایە] زالەترەک بوون؛ زۆر ترسان ≡ زهرەترک شدن

**ڕوحتووتیا** / řuĥtût(i)ya/: ناو. تێکەڵەکانزایەکە نەرم ≡ آلیاژی معدنی و نرم

**ڕوحدەبەر** / řuĥdeber/: ☜ **ڕوحلەبەر**

**ڕوحزل** / řuĥzil/: ناوەڵناو. [پلار] خۆبین؛ بەفیز؛ بەدەعیە ≡ مُتکبر

**ڕوحلەبەر** / řuĥleber/: ناو. ڕوحدەبەر؛ زیندەوەر؛ خاوەنژی ≡ جاندار

**ڕوحم** / řuĥm/: ☜ **ڕەحم**

**ڕوخس** / řuxs/: ناو. شەکەرەک؛ دەنکە ورتکەی بلۆری قەند کە بە هۆی هەندێ هۆکاری فیزیکی و جاروبار کیمیاوییەوە، لە هەندێک تراوی زۆر شیرین وەک هەنگوین و مەرەبا، بەدی دێ ≡ شکرک

⊡ **ڕوخس کردن**: پەیدا بوونی شەکەرەک ≡ شکرک زدن

**ڕوخسار** / řuxsar/: ناو. چڕوچاو؛ دەموچاو؛ ڕوو؛ دیم ≡ رُخسار

**ڕوخڵە** / řuxłe/: ☜ **ڕیخۆڵە-١**

**ڕوز** / řuz/: ناو. ڕوودۆز؛ ڕدۆز؛ بنتیێک؛ ڕەوتی پێکەوە لکاندنی پارچەی براو بە ئامانەت، بۆ تاقی کردنەوەی پێش لە دووران ≡ پرو

**ڕوژ** / řuj/: ناو. ماتیک ≡ ماتیک

**ڕوشتە** / řuşte/: ناو. ڕستە؛ ڕشتە؛ ڕشدە؛ هەڕشتە ≡ رشتەی آش

**ڕوڤک** / řuvik/: ☜ **ڕەوڤ**

**ڕوڤی** / řuvî/: ☜ **ڕێوی[١]-١**

**ڕوقیسۆر** / řuqîsor/: ناو. ڕیخۆڵە؛ ڕێڵەخۆ ≡ روده

**ڕوم** / řum/: ناو. ڕوڤک؛ بەرگەدە؛ خەمشە ≡ زهار

**ڕومان** / řuman/: ☜ **ڕۆمان**

**ڕومانتیک** / řumantîk/: ☜ **ڕۆمانتیك**

**ڕومانە** / řumane/: ☜ **ڕوممانە**

**ڕوممانە** / řummane/: ناو. نارنجۆک؛ ڕومانە؛ بۆمبای دەستی ≡ نارنجک

**ڕوممە** / řumme/: ☜ **ڕاوکە**

**ڕوناو** / řunaw/: ناو. شۆربای بێڕۆن ≡ آش بدون چربی

**ڕونگ** / řung/: ناو. خوری و مووی بۆ جاری دووهەم لە ئاژەڵ قەیچی کراو ≡ دوم پشم از حیوان چیده شده

**ڕونیسانس** / řunîsans/: ناو. ١. ڕەوتی نوێ بوونەوە؛ لە نوێ سەرهەڵدانەوە ٢. دەورانی سەرهەڵدانەوە و ژووژانەوە لە باری وێژە و زانست و هونەر و پیشەسازی لە مێژووی ئوورووپادا (لە نێوان چەرخی ١٥ تا ١٧ی زایینی) ≡ ١. نوزایی ٢. رُنسانس

**ڕوە** / řuh/: ناو. پانایی قوماش؛ بەری ماڵی گەزی ≡ عرض پارچە

**ڕوەرە** / ř(i)were/: ناو. خۆراک ≡ خوراک

**ڕوەک** / ř(i)wek/: ناو. گیا؛ گیواو؛ گژ؛ هەرچی لە زەوی شین دەبێ ≡ گیاه

**ڕوەکناسی** / ř(i)weknasî/: ناو. گیاناسی ≡ گیاەشناسی

**ڕوەن** / ř(i)wen/: ☜ **ڕۆن**

**ڕوهت** / řuht/: ناوەڵناو. ڕووت؛ پەتی؛ زەلووت ≡ لُخت

⊡ **ڕوهت کرن**: ڕووت کردنەوە ≡ لُخت کردن

**ڕوهن[١]** / řuhn/: ☜ **ڕۆن**

**ڕوهن[٢]**: ناوەڵناو. ڕوون؛ ڕۆشن ≡ روشن

**ڕوهنی** / řuhnî/: ناو. ڕووناکی؛ ڕۆشنایی ☰ روشنی

**ڕویال** / řuyal/: ☜ **ڕووتەن**

**ڕویس** / řuys/: ☜ **ڕووس ـ١**

**ڕویل** / ř(i)wîl/: ☜ **ڕوول**

**ڕوین** / ř(i)wîn/: ☜ **ڕۆن**

**ڕوێز** / ř(i)wêz/: ناو. گومان؛ دوودڵی ☰ شک؛ گمان

**ڕوێنج** / ř(i)wênc/: ناو. مافەتە؛ کرمی گیابڕ، کە حەیوان دەگەڵ گیا دەیخۆن و پێ دەمرن ☰ نوعی کرم قاتل حیوانات علفخوار

**ڕۆ١** / řo/: ناو. ١. ڕۆژ؛ ڕۆچ؛ ڕووژ؛ مەودای نێوان دوو شەو ‹نە شەو ڕاحەتم نە ڕۆ دڵشادم/ شەو زوڵفت ڕۆ رووت مەوزا وە یادم «مەولەوی»› ٢. *[مەجاز]* وەخت و هەل ٣. جۆ؛ جۆگە؛ جۆگەلە؛ جوەلە؛ بوارێکی باریکی ئاو ٤. لووتکە ئاو کە سێ لای بەژ بێ ٥. خۆر؛ خوەر؛ ڕۆژ؛ ڕۆجیار؛ ڕۆژی ئاسمان ٦. تاو؛ هەتاو؛ هەتاب؛ تیشکی خۆر ٧. ڕووناکی؛ ڕۆشنایی ☰ ١. روز ٢. موسم؛ فُرصت ٣. جوی آب ۴. خلیج ۵. خورشید ۶. آفتاب ۷. روشنایی

**ڕۆ٢**: سارسته. داخ و حەیف بۆ مردوو ‹ڕۆڵەی گوڵ دەماغ گوڵ باخانم ڕۆ/ سنۆبەر قامەت لەیلاخانم ڕۆ «خانای قوبادی»› ☰ واژەی شیون و حسرتِ فقدان

• **ڕۆ٣**: پاشەوشە. ـ ڕەو؛ بڕۆ ‹سەرمڕۆ› ☰ ـ رو؛ رونده

**ڕۆ ـ٤**: پێشگر. خوار- ‹ڕۆنیشتن؛ ڕۆکەوتن؛ ڕۆنان› ☰ فرو-

⊡ **ڕۆ کران**: بەرەو ژێر ڕژانی شتی ورد یان تراو ☰ فروریخته شدن اجسام دانەریز یا مایع

**ڕۆ کردن**: ڕۆ کرن؛ بەرەو ژێر ڕژاندنی شتی ورد یان تراو ☰ فروریختن اجسام ریز یا مایع

**ڕۆ کرن**: ☜ **ڕۆکردن**

**ڕۆ کەتن**: تاو هەڵاتن؛ خۆر کەفتن ☰ طلوع کردن آفتاب

**ڕۆ کەوتن**: پاڵ دانەوە و پشوو دان ☰ تکیه دادن؛ آسودن

**ڕۆئاوا** / řo'awa/: ☜ **ڕۆژاوا**

**ڕۆب** / řob/: ناو. جۆرێ کەوا لە ماڵەوە لەبەری دەکەن ☰ نوعی بالاپوش

**ڕۆبیان** / řob(i)yan/: ناو. مەیگوو؛ ئەنگوش؛ کێچی دەریا؛ جۆرێ قرژاڵۆکەی دەپایە لە تیرەی ڕەق‌پێستان بە چنگاڵی درێژی دەرکاوییەوە ☰ میگو

**ڕۆپل** / řopil/: ناو. هەڵپیت؛ شخەڵ؛ شیخەڵ؛ شفتیک؛ کیزاخە؛ سەرگۆز؛ داپاچ؛ کاری قرتاندن و سەرگوڵ و سەر لق کردنی پەل‌وپۆی دار و گیا ☰ هَرَس

**ڕۆپلاندن** / řop(i)landin/: چاوگ. پەرتاوتن؛ هەڵپەرتاوتن؛ پەڕاندنی لق و پۆپی دار ☰ هرس کردن درخت

**ڕۆپلیای** / řopilyay/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* داوێن و قۆڵ کورت ☰ دامن و آستین کوتاه

**ڕۆت** / řot/: ناو. داردەستی درێژ؛ چەلاکی دەستی ☰ چوبدستی بُلند

**ڕۆتک١** / řotik/: ناو. چەلاکی درێژ بۆ مازوو چنین ☰ چوب بلندِ چیدن ثمر مازوج

**ڕۆتک٢**: ئاوەڵناو. ڕووتەوەبوو لە موو یان پەڕ ☰ از مو یا پر پاک‌شده

**ڕۆج** / řoc/: ناو. ڕۆچ: ١. تاو؛ هەتاو ٢. ڕۆ؛ ڕۆژ ☰ ١. خورشید ٢. روز

**ڕۆجیاپەرشت** / řocyapeřişt/: ☜ **ڕۆجیارپەرست**

**ڕۆجیار** / řocyar/: ناو. ڕۆچیار: ١. خۆر؛ خوەر ٢. ڕۆژگار؛ زەمانە ☰ ١. خورشید ٢. زمانە؛ روزگار

**ڕۆجیارپرێس** / řocyarp(i)rês/: ☜ **ڕۆجیارپەرست**

**ڕۆجیارپەرست** / řocyarperist/: ناو. ڕۆچیارپەرس؛ ڕۆژگارپەرست؛ گوڵەبەڕۆژە؛ ڕۆجیاپەرشت؛ ڕۆجیارپەرشت؛ ڕۆجیارپرێس؛ ڕۆژان‌پەرێز؛

ڕۆزامپەرێز؛ ڕۆزیارپەرس 🇮🇷 گُل آفتابگردان

**ڕۆجیارپەڕشت / ř̂ocyarpeřişt/:** ☜ **ڕۆجیارپەرست**

**ڕۆچ / řoç/:** ☜ **ڕۆچ**

**ڕۆچن**[1] **/ řoçin/:** ناو. ڕۆچنە؛ ڕۆژن؛ ڕۆژنـە؛ ڕۆژەن؛ بانجە؛ ڕۆچینک؛ کونی دیـوار یـان سـەربان کـە تیشکی ڕۆژی پێدا دێتە ژوور 🇮🇷 روزنه

**ڕۆچن**[2]**:** ئاوەڵناو. ڕووناک؛ ڕۆشن 🇮🇷 روشن

**ڕۆچنـایی / řoçnayî/:** نـاو. ڕوونـاکی؛ ڕۆشـنی 🇮🇷 روشنایی

**ڕۆچنە / řoçne/:** ☜ **ڕۆچن**[1]

**ڕۆچوانـدن / řoç(i)wandin/:** چـاوگ. قوپانـــدن؛ قوباندن؛ قوباندن 🇮🇷 قُر کردن

**ڕۆچوو / řoçû/:** ئاوەڵناو. داتەپاو؛ داچـەقاو؛ نغـرۆ 🇮🇷 فرورفته

**ڕۆچـوون / řoçûn/:** چـاوگ. ١. قوپـان؛ داچـوون ‹سەربانەکە ڕۆچووە› ٢. چوونە خوارەوە ‹ئاو ڕۆچوو بە ناخی ئاخا و کار سـەری گـرت، لـە سـەر جـوودی لەنگـەری گـرت، گـوترا تـارن ئەوانـەی ناحـەقیکارن «هـەژار، قورئـان»› ٣. تێـکڕووخـان ‹لـەو بوومەلەرزەیەدا شارێک بە تەواوی ڕۆچـوو› 🇮🇷 ١. گود شدن ٢. فرورفتن ٣. فروریختن

**ڕۆچـوویی / řoçûyî/:** نـاو. فـیس؛ قوپـاوی 🇮🇷 فرورفتگی

**ڕۆچە / řoçe/:** ☜ **ڕۆژوو**

**ڕۆچەوان / řoçewan/:** ☜ **ڕۆژووەوان**

**ڕۆچی / řoçî/:** ☜ **ڕۆژوو**

**ڕۆچیار / řoçyar/:** ☜ **ڕۆجیار**

**ڕۆچیارپەرس / řoçyarperis/:** ☜ **ڕۆجیارپەرست**

**ڕۆچینک / řoçînik/:** ☜ **ڕۆچن**[1]

**ڕۆچێ / řoçê/:** ☜ **ڕۆژوو**

**ڕۆح / řoĥ/:** نـاو. ڕح؛ ڕوح؛ ڕەح: ١. گیـان؛ جـان؛ گان؛ گیون؛ ڕەوانی گیاندار ٢. هەوێن و هێمـای ژوورەسروشتی، هەتاهەتایی و غەیرەماکی مرۆ کە بەپێی بیر و بڕوای ئایینی، پاش مەرگ لـە لـەش جیـا دەبێتـەوە ٣. ڕوو؛ تـوخمێکی کیمیـایی کانزایی بە ژمارەی ئەتومی ٣٠ و کێشـی ئـەتومی ٦٥،٣٧، کانزایەکی تـورتی سـپی مەیلـەو شـین، ناتێکەڵاو لە ئاو، تێکـەڵاو لـە ئەسـید یـان بـازی داخدا کە لە کانزاکاری و دەرهێنـانی ئالیـاژدا بـە کار دێ ٤. هەر بەرهەمێکی چێکـراو لـە ڕۆح 🇮🇷 ١و٢. روح ٣و٤. روی

▣ **ڕۆحی پیرۆز:** یەکێک لە سـێ پایـەی پـیرۆزی دینی مەسیح 🇮🇷 روح‌القدس

**ڕۆحی ڕەوان:** گیانی شیرین ‹لەبی ڕۆحی ڕەوان و نێوچەوانی ڕۆژی لێ دەتکێ/ زوبانی تا شەکەرڕێژە، دەهانی گەوهەرئەفشانە «مەحوی»› 🇮🇷 جان جانان

▣ **ڕۆح تۆقین:** ☜ **ڕۆح چوون**

**ڕۆح چوون:** *[مەجاز]* ڕۆح تـۆقین؛ زۆر ترسـان 🇮🇷 زهره‌ترک شدن

**ڕۆحپەروەر / řoĥperwer/:** ناو. ڕۆحگەشێن؛ هـۆی گەشانەوەی ڕۆح ‹دەنگی ڕۆحپەروەر› 🇮🇷 روح‌پرور

**ڕۆحزل / řoĥzil/:** ئاوەڵـناو. *[مـەجازی، پـلار]* فیـزن؛ خۆبایی 🇮🇷 مُتکبر

**ڕۆحسـووک / řoĥsûk/:** ئاوەڵـناو. *[مـەجاز]* ١. سۆکوسەڵت؛ سـۆکوسـۆڵ؛ سـاز و سـازگار ٢. بێ‌گیرۆدەیی و نیگەرانی؛ بـێ دڵـلەدوایی 🇮🇷 ١. سبکبال ٢. سبکبار

**ڕۆحگەشێن / řoĥgeşên/:** ☜ **ڕۆحپەروەر**

**ڕۆحلاوێن / řoĥlawên/:** ئاوەڵناو. هۆی لاواندنەوەی هەست 🇮🇷 روح‌نواز

**ڕۆحلەفەنـدی / řoĥlefendî/:** نـاو. جـۆرێ کراسـی ژنانەی قەدیم 🇮🇷 نوعی پیراهن زنانه‌ی قدیمی

**ڕۆحی / řoĥî/:** ئاوەڵناو. ١. دەروونی؛ سەر بە ڕۆح و گیـان ‹ئاسـوودەیی ڕۆحـی› ٢. ڕۆحینـە؛ لـە ڕۆح دروسـتکراو ‹قابلەمـەی ڕۆحـی› 🇮🇷 ١. روحی ٢. از جنس روی

**ڕۆحینه / ṙohîne/:** ☜ **ڕۆحی ـ٢**

**ڕۆحیه / ṙoĥ(i)ye/:** ناو. حاڵ؛ دۆخی سەر بە هەست یان ئاکاری کەسێک ‹ڕۆحیەی هاوکاری› ☰ روحیه

**ڕۆخ / ṙox/:** ناو. ڕەخ؛ قەراغ؛ لێوارە ☰ کرانه؛ کناره

**ڕۆخانه / ṙoxane/:** ناو. چەم؛ چۆم ☰ رود

**ڕۆخله / ṙox(i)ḷe/:** ☜ **ڕیخۆڵه ـ١**

**ڕۆخەوار / ṙoxewar/:** ناو. پلاژ؛ لێوار ☰ پلاژ

**ڕۆدا / ṙoda/:** ناو. فاڵ؛ کاری بەخت خوێندنەوە ☰ فال

**ڕۆدی / ṙodî/:** ☜ **ڕیخۆڵەـ١**

**ڕۆریس / ṙorîs/:** ناو. گیایەکی ڕەنگ سوورە سابوونکەر دەکاری دێنن ☰ گیاهی است

**ڕۆ ـ ڕۆ¹ / ṙo ṙo/:** ناو. شین و شەپۆر ‹هەرچی دەیبینی دەس‌بەئەژنۆیە/ لە هەموو لاوە شین و ڕۆڕۆیە «هێمن»› ☰ فغان برای مرده

**ڕۆ ـ ڕۆ²:** سارستە. ڕۆ؛ وشەی شین‌گێڕی ☰ واژەی نوحه برای مرده

**ڕۆز / ṙoz/:** ناو. گوڵەخونچە؛ گوڵەخونچە؛ سوورگوڵ؛ باتینۆک؛ گیایەکی ڕازێنەرە بە لاسکی درکن، گوڵی بۆنخۆشی سپی، زەرد یا سوورەوە ☰ رُز

**ڕۆزامپەرێز / ṙozamperêz/:** ☜ **ڕۆجیارپەرست**

**ڕۆزقە / ṙozqe/:** ناو. گیایەکە ئەخورێ ☰ گیاهی خوردنی

**ڕۆزگار / ṙozgar/:** ☜ **ڕۆژگار**

**ڕۆزنامه / ṙozname/:** ☜ **ڕۆژنامه**

**ڕۆزی / ṙozî/:** ☜ **ڕۆژیـ٢**

**ڕۆزیارپەرس / ṙozyarperis/:** ☜ **ڕۆجیارپەرست**

**ڕۆژ / ṙoj/:** ناو. ١. ڕۆ؛ ڕووژ؛ مەودای نێوان دوو شەو ٢. ڕۆژیار؛ ڕۆجیار؛ خۆر؛ خوەر ‹ڕۆژ کە هەڵهات، ئاواش دەبێ «مەسەل»› ٣. *[مەجاز]* وەخت؛ کات ‹ڕۆژ، ڕۆژی کارە› ٤. *[مەجاز]* بەخت؛ تاڵە ‹ڕۆژڕەش› ٥. ماتیک؛ ماکێکی ڕەنگی بۆ ڕەنگ کردنی لێو ☰ ١. روز ٢. خورشید ٣. وقت ٤. شانس ٥. روژ لب

■ **ڕۆژا ئینێ:** جوعمە؛ هەینی ☰ آدینه

**ڕۆژا پاشین:** ☜ **ڕۆژی پەسلان**

**ڕۆژا پەسلانێ:** ☜ **ڕۆژی پەسلان**

**ڕۆژا سلاتێ:** ☜ **ڕۆژی پەسلان**

**ڕۆژە ڕەشەکە:** *[کینایە]* داماوی و موحتاجی زۆر لە قات و قڕیدا ☰ روز سیاه

**ڕۆژی بەرێ:** ١. دوێنێ؛ دوێکە ٢. ڕۆژی هەوەڵی؛ ڕۆژی ئەزەلێ ☰ ١. دیروز ٢. روز ازل

**ڕۆژی پساتێ:** ☜ **ڕۆژی پەسلان**

**ڕۆژی پەسلان:** ڕۆژا پاشین؛ ڕۆژا پەسلانێ؛ ڕۆژا سلاتێ؛ ڕۆژی پساتێ؛ سەلا؛ قیامەت؛ ڕۆژی سەرهەڵدانەوەی پاش مردن کە بە چاکە و خراپەی خەڵک ڕادەگەن ‹وا پەسلان نزیک کەوتەوە و هەیف بوو بە دوو کەرتەوە «هەژار، *قورئان*»› ☰ روز قیامت

**ڕۆژی ڕووناک:** ١. خۆر؛ تاو ٢. *[مەجاز]* زۆر ڕۆشن و لە بەر چاو ٣. *[مەجاز]* هیوا؛ ئاوات؛ بەخت ☰ ١. خورشید ٢. روز روشن ٣. اقبال؛ طالع

⊡ **ڕۆژ ئاوا بوون:** خۆر نیشتن ☰ آفتاب غروب کردن

**ڕۆژ برن:** ☜ **ڕۆژ گەستن**

**ڕۆژ بوون:** خۆش بوون؛ بۆ لوان؛ بۆ هەڵسووڕان ‹پشیله ڕۆژیەتی لە نێو مشکانا› ☰ روزگار به کام بودن

**ڕۆژ بوونەوە:** شەو بە سەر چوون ☰ صبح شدن

**ڕۆژ بە سەر بردن:** ڕۆژ قەتاندن؛ ڕۆژگار دانە سەر ☰ روزگار گذراندن

**ڕۆژ داگەڕان:** ڕۆژ داگەڕیان؛ لە دوای نیوەڕۆوە، کە ڕۆژ بە لای ڕۆژاوادا دادەگەڕێ ☰ هنگام زوال روز و فرارسیدن غروب

**ڕۆژ داگەڕیان:** ☜ **ڕۆژ داگەڕان**

**ڕۆژ قەتاندن:** ☜ **ڕۆژ بە سەر بردن**

**ڕۆژ کردنەوە:** ١. شەو بە سـەر بـردن ٢. *[مەجاز]* شەونخوونی کێشان ▬ ١. شب گذراندن ٢. شب بیدار ماندن

**ڕۆژ گەستن:** ڕۆژ برن؛ تاوەنگاز بـوون ▬ آفتـابزده شدن

**ڕۆژ گیران:** خـۆر گـیران؛ ڕۆژ خـەیرین؛ جـێ گـرتنی مانـگ لـە نێـوان زەوی و خـۆردا، بـە شێوەیەک کە سێبەری مانـگ بکەوێتـە سـەر بەشێک لە زەوی و ئەو بەشە بۆ تاوێک تاریـک دابێ ▬ کسوف روی دادن

**ڕۆژئاڤا** / ŗoj'ava/: ☜ **ڕۆژاوا**

**ڕۆژئاوا** / ŗoj'awa/: ☜ **ڕۆژاوا**

**ڕۆژئاوایی** / ŗoj'awayî/: ☜ **ڕۆژاوایی**

**ڕۆژئەژمێر** / ŗoj'ejmêr/: ☜ **ڕۆژمێر**

**ڕۆژاڤا** / ŗojava/: ☜ **ڕۆژاوا**

**ڕۆژاڤایی** / ŗojavayî/: ☜ **ڕۆژاوایی**

**ڕۆژان** / ŗojan/: ئاوەڵکار. لە ڕۆژانی پێشوودا ‹ڕۆژان دیرتر دەچووینە سەر کار› ▬ روزهای قبل

**ڕۆژان پەرێز** / ŗojanperêz/: ☜ **ڕۆجیارپەرست**

**ڕۆژانە**[1] / ŗojane/: ئاوەڵناو. ڕۆژینە؛ پێوەندیـدار بـە ڕۆژەوە ‹خواردنی ڕۆژانە› ▬ روزانه

**ڕۆژانە**[2]: ئاوەڵکار. ڕۆژینە: ١. لە ڕۆژێکدا ‹ڕۆژانە دە نانی دەخوارد!› ٢. لە کاتی ڕۆژدا ‹ڕۆژانە ناخـەوم› ▬ ١و٢. روزانه

**ڕۆژاوا** / ŗojawa/: ناو. ڕۆئاوا؛ ڕۆژئاوا؛ ڕۆژاڤا؛ ڕۆئـاوا: ١. خۆراوا؛ خۆرنشین؛ ڕۆژنشین ٢. زەردەپـەڕ ▬ ١. مغرب ٢. غروب

**ڕۆژاوایی** / ŗojawayî/: ئاوەڵناو. ڕۆژئاوایی؛ ڕۆژاڤایی؛ سەر بە خۆرنشین ▬ غربی

**ڕۆژباش** / ŗojbaş/: دۆعا. ڕێزوتـەیێ کـە لـە کـاتی ڕۆژدا بـۆ چـاک و خۆشـی بـە کـار دێـت، واتـا: «هیـوادارم ڕۆژێکـی باشـت هـەبێ» ‹ڕۆژبـاش پەنجەکانم! ڕۆژباش! «پەشێو»› ▬ روزبەخیر

**ڕۆژبڕ** / ŗojbiŗ/: ☜ **ڕۆژمز**

**ڕۆژبژێر** / ŗojb(i)jêr/: ☜ **ڕۆژمێر**

**ڕۆژبەڕۆژ** / ŗojbeŗoj/: ئاوەڵکار. ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ؛ هەموو ڕۆژ ‹ڕۆژبەڕۆژ بۆ پێش ئەچێ ئۆخـەی شـکور هەنگاوی کورد «موفتی پێنجوێنی»› ▬ روزبەروز

**ڕۆژپەرست** / ŗojperist/: نـاو. خمخمۆک؛ خەمەگرۆ ▬ آفتابپرست

**ڕۆژپـەڕ**[1] / ŗojpeŗ/: نـاو. ڕۆژاوا؛ کۆتـایی ڕۆژ ‹تـۆ خاوەر و شۆق دەدەیتە چاوم/ مـن ڕۆژپـەڕ و ئـاگرین هەناوم «هەژار، *مەموزین*»› ▬ غروب

**ڕۆژپەڕ**[2]: ئاوەڵکار. دەمی ڕۆژاوا؛ ئێـوارەی درەنـگ ‹ڕۆژپەڕ دەگەڕێتەوە› ▬ وقت غروب

**ڕۆژپێو** / ŗojpêw/: نـاو. ڕۆژژمێـر؛ ئـەوەی لەمـەڕ ڕۆژەکانی حەفتە، مانگ یان ساڵدا زانیاریمان پێ دەدا ▬ روزشمار

**ڕۆژتـا** / ŗojta/: ناو. نۆبەتێ کە هەر بە ڕۆژە ▬ تـب روزانه

**ڕۆژڕەش** / ŗojřeş/: ئاوەڵناو. چـارەڕەش؛ بەدبـەخت ▬ سیەروز

**ڕۆژڕەشی** / ŗojřeşî/: ناو. چارەڕەشی؛ بەدبەختی ▬ سیەروزی

**ڕۆژژمێر** / ŗojj(i)mêr/: ☜ **ڕۆژمێر**

**ڕۆژکـوێری** / ŗojk(i)wêrî/: نـــاو. دۆخ یـــــان چۆناوچۆنی کز بوونی سۆمای چـاو لـە ڕوونـاکی زۆردا. هەروەها: **ڕۆژکوێر** ▬ روزکوری

**ڕۆژگ** / ŗojig/: ☜ **ڕۆژو**

**ڕۆژگار** / ŗojgar/: ناو. ڕۆزگار ‹ڕۆژگار بـوو بـە سـاڵ، سک بوو بە جەوال «مەسەل»› ▬ روزگار

**ڕۆژگارپەرست** / ŗojgarperist/: ☜ **ڕۆجیارپەرست**

**ڕۆژگاز** / ŗojgaz/: ☜ **ڕۆژگەز**

**ڕۆژگەڕ** / ŗojgeŗ/: ئاوەڵناو. ڕۆگێل؛ بـە چـالاکی و

گەڕان لە ڕۆژدا (بۆ گیانەوەران) ☰ روزگرد

**ڕۆژگەز** / řojgez/: ناوەڵناو. ڕۆژگاز؛ ڕۆژگەستی؛ تاوەنگاز؛ تاوانگاز؛ تاوبردوو؛ خۆربردوو ☰ آفتابزده

**ڕۆژگەستی** / řojgestî/: ☜ **ڕۆژگەز**

**ڕۆژگەوان** / řoj(i)gewan/: ☜ **ڕۆژووەوان**

**ڕۆژگەوانی** / řoj(i)gewanî/: ناو. بەڕۆژوویی؛ کاری ڕۆژوو گـرتن و بـەجێ هێنـانی دابی ڕۆژوو ☰ روزەداری

**ڕۆژمز** / řojmiz/: ناوەڵناو. ڕۆژبـڕ؛ ڕۆژمـزە؛ ڕۆژمـژ؛ وەرگری مز بە شێوەی ڕۆژانە ☰ روزمزد

**ڕۆژمزە** / řojm(i)ze/: ☜ **ڕۆژمز**

**ڕۆژمژ** / řojmij/: ☜ **ڕۆژمز**

**ڕۆژمێر** / řojmêr/: نـاو. ڕۆژنـەژمێر؛ ڕۆژبژێـر؛ ڕۆژژمێر؛ ڕووژشمار؛ ساڵپێو ☰ سالنامە؛ تقویم

**ڕۆژن** / řojin/: ☜ **ڕۆچن**[1]

**ڕۆژناڕۆژ** / řojnařoj/: ناوەڵکار. ڕۆژنـەڕۆژێ؛ ڕۆژێ نە ڕۆژێ؛ دوو ڕۆژ جارێ ☰ روز در میان

**ڕۆژناڕۆژە** / řojnařoje/: نـاو. مالاریا؛ نۆگە؛ نۆبـەتێ ☰ مالاریا

**ڕۆژنامە** / řojname/: نـاو. ڕۆزنامە؛ بلاڤۆکی چـاپی بە شێوەی پەڕە یان پەڕەگەلی بێ بەرگ و تاچن کە زۆرتـر لـە کـاتێکی دیـاریکراوی ڕۆژانـە یـان حەفتانەدا بلاو دەبێتەوە و ناواخنی دەنگ و باسی ڕۆژ، بابـەتی ڕامیـاری، کۆمەڵایـەتی، هونـەری و وەکوو ئەوانەیە ☰ روزنامە

**ڕۆژنامەچی** / řojnameçî/: نـاو. کەسـێ کـە لـە ڕۆژنامە کار دەکا ☰ کارمند روزنامە

**ڕۆژنامەخوێن** / řojnamex(i)wên/: ناوەڵناو. هۆگر و خۆگرتوو بە ڕۆژنامە خوێندن ☰ روزنامەخوان

**ڕۆژنامەفرۆشی** / řojnamef(i)roşî/: نـاو. ١. کـاری فرۆشتنی ڕۆژنامە ٢. شوێنێ کـە ڕۆژنامـەی لـێ دەفرۆشـن. هـەروەها: **ڕۆژنامـەفـرۆش** ☰ ١و٢. روزنامەفروشی

**ڕۆژنامەنـووس** / řojnamenûs/: نـاو. ڕۆژنامـەوان؛ وتارنووسی ڕۆژنامە ☰ روزنامەنگار

**ڕۆژنامەنووسی** / řojnamenûsî/: ناو. ڕۆژنامـەوانی: ١. کار و ڕەوتی نووسینی وتار لە ڕۆژنامەدا ٢. کار و ڕەوتی ڕێـکوپێـک کـردن و چـاپ و بـڵاو کردنەوەی ڕۆژنامە ☰ ١و٢. روزنامەنگاری

**ڕۆژنامـەوان** / řojnamewan/: نـاو. ڕۆژنامـەنووس؛ ژوورنالیست ☰ ژورنالیست

**ڕۆژنامەوانی** / řojnamewanî/: ناوەڵناو. ڕۆژنامەیی؛ ژوورنالیستی ☰ ژورنالیستی

**ڕۆژنامەیی** / řojnameyî/: ☜ **ڕۆژنامەوانی**

**ڕۆژناهی** / řojnahî/: ☜ **ڕووناکی**

**ڕۆژنایی** / řojnayî/: ☜ **ڕووناکی**

**ڕۆژنشین** / řojn(i)şîn/: ☜ **ڕۆژاوا-١**

**ڕۆژنە** / řojne/: ☜ **ڕۆچن**[1]

**ڕۆژنەڕۆژێ** / řojneřojê/: ☜ **ڕۆژناڕۆژ**

**ڕۆژوو** / řojû/: ناو. ڕۆچـە؛ ڕۆچـی؛ ڕۆچـێ؛ ڕۆژگ؛ ڕۆژی؛ عیبادەتێک بە شـێوەی خـۆ پاراسـتن لـە خواردن و خواردنەوە و هەروەها بڕێ کاریتر، لـە ڕۆژ، حەفتە یان مانگێکی دیاریکراودا ☰ روزە

▣ **ڕۆژوو خواردن**: ڕۆژوو شکاندن؛ ڕۆژوو نەگرتن؛ بە ڕۆژوو نەبوون ☰ روزەخواری کردن

**ڕۆژوو شـکاندن**: ١. ☜ **ڕۆژوو خـــــواردن** ٢. بەربانگ کردنـەوە؛ لـە کـاتی بەربانگـدا ڕۆژوو شـکاندن ☰ ١. ☜ **ڕۆژوو خـواردن** ٢. افطـار کردن

**ڕۆژوو کردنەوە**: بەربانگ کردنەوە؛ شـت خـواردن دوای تەواو بوونی ماوەی ڕۆژوو ☰ افطار کردن

**ڕۆژوو گرتن**: بە ڕۆژوو بـوون؛ وە ڕۆژگ بـوون ☰ روزە گرفتن

**ڕۆژووخۆر** / řojûxor/: نـاو. *[ئایین]* کەسـێ کـە بـە ڕۆژوو نابێ ☰ روزەخوار

**ڕۆژووگر** / řojûgir/: ناو. *[ئایین]* کەسێ کە بـە ڕۆژوو

ئەبێ ☰ روزەگیر

**ڕۆژووەوان / řojûwewan/**: ناو. *[ئایین]* ڕۆچەوان؛ ڕۆژگەوان؛ ڕۆژییەوان؛ کەسێ کە بەڕۆژووە ☰ روزەدار

**ڕۆژەجووت / řojecût/**: ناو. بەشی کێڵانی ڕۆژێک لە زەوی ☰ مقدار زمینی که در یک روز شخم زنند

**ڕۆژەڕێ / řojeřê/**: ناو. ڕێگەی ڕۆژێک بە پیادە ☰ یک روزه راه

**ڕۆژەڤ / řojev/**: ناو. بارودۆخ و ڕووداوی باوی ڕۆژ ☰ رخدادهای روز

**ڕۆژەکی / řojekî/**: ☜ **ڕۆژێك**

**ڕۆژەڵات / řojełat/**: ☜ **ڕۆژهەڵات**

**ڕۆژەن / řojen/**: ☜ **ڕۆچن[1]**

**ڕۆژهەڵات / řojhełat/**: ناو. ڕۆژەڵات؛ ڕۆهەڵات؛ خۆرهەڵات؛ خاوەر ☰ مشرق

▣ **ڕۆژهەڵاتی دوور**: وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی هیندوستان (وەک: مالیزی، ئەندونیزی، فیلیپین، چین، کورە، ژاپون و...) ☰ خاور دور

**ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست**: ڕۆژهەڵاتی ناوین؛ وڵاتانی باشووری ڕۆژاوای ئاسیا لە سووریاوە تا هیند (وەک: ئێران، عیراق، پاکستان و...) ☰ خاورمیانه

**ڕۆژهەڵاتی ناوین**: ☜ **ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست**

**ڕۆژهەڵاتی نزیک**: وڵاتانی باکووری ڕۆژهەڵاتی ئەفریقا تا عەرەبستان (وەک: تورکیە، سووریە، لوبنان، ئوردون و ئیسرائیل) ☰ خاور نزدیک

**ڕۆژی / řojî/**: ناو. ١. ☜ **ڕۆژوو** ٢. ڕۆزی؛ رزق؛ بژیو ☰ ١. ☜ **ڕۆژوو** ٢. رزق؛ روزی

**ڕۆژیار / řojyar/**: ☜ **ڕۆژ-٢**

**ڕۆژیک / řojîk/**: ناو. نیسک؛ نژی؛ نژوو؛ مارجوو؛ وانج ☰ عدس

**ڕۆژین / řojîn/**: ئاوەڵناو. ڕووناک، وەک ڕۆژ ☰ روشن، مثل آفتاب

**ڕۆژینگ / řojîng/**: ناو. ١. سۆپا؛ سۆمپا؛ سۆبە ٢. دووکەڵکێش ☰ ١. بُخاری ٢. دودکش

**ڕۆژینە / řojîne/**: ☜ **ڕۆژانە**

**ڕۆژییەوان / řojîyewan/**: ☜ **ڕۆژووەوان**

**ڕۆژێ / řojê/**: ☜ **ڕۆژێك**

**ڕۆژێک / řojêk/**: ئاوەڵکار. ڕۆژەکی؛ ڕۆژێ: ١. لە ڕۆژێکدا ‹ئەو دەرمانە ڕۆژێک بیخۆ! ڕۆژێک مەیخۆ!› ٢. یەک ڕۆژ ‹قەت بیرم لەوە نەکردبوو کە ڕۆژێک باوکم دەمرێ و بە سەری شلکی، هەتیو دەبم «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ ١. یک روزه؛ در یک روز ٢. یک روز

**ڕۆست / řost/**: ناو. دێ؛ لادێ ☰ روستا

**ڕۆسەکنان / řoseknan/**: چاوگ. داسەکنان؛ سرەوتن ☰ آرام گرفتن

**ڕۆسەم / řosem/**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* پاڵەوان؛ بەهێز ☰ پهلوان

**ڕۆشان / řoşan/**: ☜ **ڕوشان**

**ڕۆشتن / řoştin/**: ☜ **ڕۆیشتن**

**ڕۆشن[1] / řoşin/**: ئاوەڵناو. ١. ڕووناک؛ ڕوون ٢. دیار و زانراو ٣. هەڵکراو؛ داییساو ☰ ١. روشن ٢. معلوم ٣. افروخته

▣ **ڕۆشن بوونەوە**: ١. دیار / دیاری دان ٢. گەشانەوەی ئاگر ٣. جوان تێگەیشتن و هەڵە نەکردن ☰ ١. معلوم شدن ٢. برافروختن مجدد آتش ٣. روشن شدن

**ڕۆشن کردن**: ١. هەڵکردنی ئاگر؛ داییسان ٢. هەڵکردنی چرا یان هەر ئامێرێکی کارەبایی ٣. دیار کردنی نەزانراو ☰ ١. افروختن ٢. روشن کردن ٣. مشخص کردن

**ڕۆشن کردنەوە**: ١. گەشاندنەوە؛ هەڵکردنەوەی ئاگر ٢. دیار کردنی نەزانراو ٣. شی کردنەوە ☰ ١. برافروختن مجدد آتش ٢. معلوم کردن ٣. توضیح دادن

**ڕۆشن[2]**: ئاوەڵکار. بە ڕوونی ‹گوێ گرە با ڕۆشن پێو

بلێم چم دەوێ› 🇮🇷 روشن؛ صریح؛ آشکار

**ڕۆشنا**[1] / řoşna/: ناو. ڕۆشنی ‹بە ڕۆشنا بێنەوە!› 🇮🇷 روشنی

**ڕۆشنا**[2]: ئاوەڵناو. ڕۆشن؛ ڕووناک 🇮🇷 روشن

**ڕۆشنا**[3]: پێرۆ. ← **ئاشنا و ڕۆشنا**

**ڕۆشناکی** / řoşnakî/: ☜ **ڕووناکی**

**ڕۆشنایی** / řoşnayî/: ناو. ڕووناکی؛ ڕۆشنی 🇮🇷 روشنایی

**ڕۆشنبیر** / řoşinbîr/: ئاوەڵناو. ڕووناکبیر؛ تێگەیشتوو؛ خاوەن بیر و ڕوانینێکی زانایانە، ئاگا و دوور لە مێشکوشکی و ئەفسانە. هەروەها: **ڕۆشنبیری** 🇮🇷 روشنفکر

**ڕۆشنکەر** / řoşinker/: ئاوەڵناو. ڕووناکیدەر ‹زیندووکەرەوەی ئاواتی بێ گیانم/ ڕۆشنکەری ڕێگای ژین و مانم «هەردی»› 🇮🇷 روشنگر

**ڕۆشنکەرەوە** / řoşinkerewe/: ئاوەڵناو. بە تایبەتمەندی ڕووناکی بەخشینەوە ‹ئەمانە هەموو جوانن، شیرینن/ ڕۆشنکەرەوەی شەقامی ژینن «گۆران»› 🇮🇷 روشنی‌بخش

**ڕۆشنی** / řoş(i)nî/: ناو. ١. ڕووناکی؛ ڕۆشنایی ٢. [کنایە] ئاشکرایی؛ دیاری 🇮🇷 ١. روشنی ٢. آشکاری

**ڕۆغان** / řoğan/: ☜ **ڕۆن**

**ڕۆڤار** / řovar/: ناو. گۆڤار؛ گۆوار 🇮🇷 مجله

**ڕۆڤک** / řovik/: ناو. تووکەبەر؛ مووی بەرگەدە 🇮🇷 موی زهار

**ڕۆڤە** / řove/: ناو. کرێوە و بادەوە؛ باسریشک 🇮🇷 کولاک

**ڕۆڤی** / řovî/: ناو. ١. ☜ **ڕێخۆڵە ـ١** ٢. ☜ **ڕێوی**[1]**ـ١**

▣ **ڕۆڤی ڕەش:** ☜ **ڕێخۆڵەی گەورە**

**ڕۆڤی زراڤ:** ☜ **ڕێخۆڵەی باریک**

**ڕۆڤی ستوور:** ☜ **ڕێخۆڵەی گەورە**

**ڕۆق** / řoq/: ناو. شۆربە؛ چێشتی تراو 🇮🇷 شوربا

**ڕۆقاو** / řoqaw/: ناو. ڕۆقە؛ ئاوی پاشماوەی چێشتی تراو 🇮🇷 آب مانده از آش

**ڕۆقە** / řoqe/: ☜ **ڕۆقاو**

**ڕۆکراو** / řok(i)raw/: ئاوەڵناو. بەرەوژێر داڕژاوی شتی وردە یان تراو 🇮🇷 فروریختە (مایع یا اشیاء ریزدانە)

**ڕۆکەوان** / řokewan/: ☜ **ڕەوکەوان**

**ڕۆگێڵ** / řogêł/: ☜ **ڕۆژگەڕ**

**ڕۆل**[1] / řol/: ناو. جۆرێ گیا کە بە دار هەڵدەگەڕێ 🇮🇷 پیچک

**ڕۆل**[2]: ئاوەڵناو. حۆل؛ گێژ و پەتیار 🇮🇷 گیج و منگ

**ڕۆلپلاک** / řolp(i)lak/: ناو. پێکهاتەیەکی پلاستیکی یان چێوی هلۆل بۆ قایم کردنی پێچ لە پنتێکدا کە بە مەتە کون کراوە 🇮🇷 رول‌پلاک

**ڕۆڵ** / řoł/: ناو. ١. فەرمان (لە ماشین و ...دا) ٢. دەور؛ نەخش (لە شانۆ یان فیلمدا) 🇮🇷 ١. فرمان ٢. نقش

**ڕۆڵە** / řołe/: ناو. ڕووڵە؛ زار؛ فرزەند؛ بەچکەی بنیادەم ‹گوتی: ڕۆڵە گیان دەزانم بۆ چیتانە، وەرن مامی خۆتان بکەنە شەریک! «هەژار، چێشتی مجێور»› 🇮🇷 فرزند

**ڕۆڵەخوای** / řołex(i)way/: ☜ **ڕێخۆڵە ـ١**

**ڕۆڵەڕۆ** / řołeřo/: سارستە. شین و گریان بۆ منالی مردوو ‹هەرکەسێ ئەیکا مەنعی من و تۆ/ لە مالی نەبڕێ دەنگی ڕۆڵەڕۆ «فولکلۆر»› 🇮🇷 شیون برای فرزند مُردە

**ڕۆماتیسم** / řomatîsm/: ناو. باداری؛ ژان و ژوو؛ نەخۆشی و ژانی جومگە و ماسوولکە 🇮🇷 رُماتیسم

**ڕۆماڵ** / řomał/: ناو. کوندە ڕۆماڵ 🇮🇷 جُغد ماهی‌خور

**ڕۆمان** / řoman/: ناو. ڕومان؛ چیرۆکی درێژ لە سەر ژیانی مرۆڤ 🇮🇷 رُمان

**ڕۆمانتیک** / řomantîk/: ئاوەڵناو. ڕومانتیک؛

هەستبزوێن: ١. هاوگەری ڕومانتیسیسم ‹شێوازی ڕۆمانتیک› ٢. هەستیار؛ هەستۆک و خەیالاوی ‹ئەتۆ زۆر ڕۆمانتیکی› ٣. بە تایبەتمەندی و چۆناوچۆنی بزواندنی خەیاڵ و هەستی خۆشەوە ‹دیمەنی ڕۆمانتیک› ٤. بە ناوەرۆکێکی هەستبزوێن و ئەویندارانەوە ‹ژیانی ڕۆمانتیک› ☰ ١تا٤. رمانتیک

**ڕۆمەڵخەزا / řomełxeza/:** ☜ **ڕۆمەڵغەزا**

**ڕۆمەڵغەزا / řomełğeza/:** ناو. ڕۆمەڵخەزا؛ زەنا ـ زەنا و ئاژاوە و بشێوی ☰ همهمه و آشوب

**ڕۆمی / řomî/:** ناو. ١. تورکی عوسمانی ٢. خواجانشین؛ خواجانە؛ سەکۆی بەر درگا ☰ ١. تُرک عثمانی ٢. سکوی دو طرف دروازه

**ڕۆن / řon/:** ناو. ڕۆغان؛ ڕوون؛ ڕووین؛ ڕوین؛ ڕوهن؛ ڕوەن: ١. دوهن؛ ڕوان؛ دون؛ هەرکام لە ماکگەلی چەور و تراو، نیوەتراو یان لیق کە تێکەڵی ئاو نابێ بەلام تێکەڵی ئەلکول و ئیتر دەبێ و لە بان قوماش یان کاغەزەوە شوێنی دەمێنێتەوە ٢. بەرهەمێکی خواردەمەنی چەور، خەست یان تراو کە لە چێشت دروست کردندا بە کار دێ ‹ڕۆن بۆ هیزە، گۆشت بۆ دیزە «مەسەل»› ٣. مەڵهەم؛ دەرمانێک لە ماکی چەور کە دەیساونە شوێنی برین یان ئێشەوە ٤. هەرکام لە چەوریگەلی ڕەوانکەر کە لە پیشەسازیدا بۆ ڕەوانی و کەم کردنەوەی لێکگیران بە کار دێ و زۆرتر لە نەوتی دەگرن ‹وەک: گریس و واسکازین و...› ٥. هەرکام لە چەوریگەلی بریقەدەر ☰ ١تا٥. روغن

▣ **ڕۆن خیگە:** ☜ **ڕۆنی کوردی**

**ڕۆنی ڕومک:** ☜ **ڕۆنی گیایی**

**ڕۆنی کوردی:** ڕۆنی کەرە؛ ڕۆنی خۆمانی؛ ڕۆنی خیگە؛ ڕۆنێ کە لە کوڵاندن و پاڵاوتنی کەرە بەرهەم دێ ☰ روغن کرمانشاهی

**ڕۆنی کەرە:** ☜ **ڕۆنی کوردی**

**ڕۆنی گیایی:** ڕۆنی ڕوەک؛ ڕۆنێ کە لە تۆم و گوڵی گیا دەگیرێ ‹وەک: ڕۆنی گوڵەبەڕۆژە و زوڕات› ☰ روغن گیاهی

**ڕۆنی موتۆن:** ڕۆنێ کە لە نەوت بەرهەم دێ و بۆ ڕەوان کردنی بەندەکانی موتور بە کار دەچێ ☰ روغن موتور

▣ **ڕۆن گرتن:** هەڵچزاندن یان گووشین و چەورایی لێ گرتن ☰ روغن گرفتن

**ڕۆنان / řonan/:** چاوگ. دانان؛ نیان؛ دانیان: ١. نیان ٢. هێنانە ئاراوە ☰ ١. نهادن ٢. وضع کردن

**ڕۆناندن / řonandin/:** چاوگ. ڕووناک کردن ☰ روشن کردن

**ڕۆنانگە / řonange/:** ناو. ڕانگە؛ نمایشگا؛ پیشانگە؛ جێگەی ڕانان ☰ نمایشگاه

**ڕۆناو / řonaw/:** ناو. ڕۆنی زۆری دەگەڵ ئاوی کەم تێکەڵاو ☰ آب ـ روغن

**ڕۆناوی / řonawî/:** ئاوەڵناو. چەور؛ ڕۆن‌تێ‌هەڵسواو ☰ روغنی

**ڕۆناهی / řonahî/:** ☜ **ڕووناکی**

**ڕۆنتک / řontik/:** ☜ **ڕۆندک**

**ڕۆند / řond/:** ئاوەڵناو. سەرڕاست؛ ڕێک ☰ روند

**ڕۆندار / řondar/:** ئاوەڵناو. ١. تیشکدەر ٢. چەور ☰ ١. روشنایی‌بخش ٢. چرب

**ڕۆندان / řondan/:** ناو. ڕووندان؛ دەفری ڕۆن ☰ روغندان

**ڕۆندک / řondik/:** ناو. ڕندک؛ ڕۆنتک؛ ڕۆنکی؛ فرمێسک؛ ئەسر؛ ئەسرین ☰ اشک

**ڕۆندە / řonde/:** ناو. جاڕ؛ بەیار ☰ بایر

**ڕۆنڤیس / řon(i)vîs/:** ناو. ١. ڕوونووس ٢. کۆپی ☰ ١. رونویس ٢. کُپی

**ڕۆنک / řonik/:** ناو. ڕووناکی؛ ڕۆشنایی؛ ڕۆناهی ☰ روشنایی

**ڕۆنکاچـاڤ** / řonkaçav/: نـاو. ڕۆنیاچـاڤ؛ بینـایی؛ سۆمای چاو 🇮🇷 دید چشم

**ڕۆنکاری** / řonkarî/: ناو. کاری چەور کردنی بەنـد و جومگـەی موتـور بـۆ ڕەوان کـار کـردنی 🇮🇷 روغن‌کاری

**ڕۆنکایی** / řonkayî/: ☜ **ڕووناکی**

**ڕۆنکی** / řonkî/: ☜ **ڕۆندك**

**ڕۆنگەرچەک** / řongerçek/: نـاو. شـیرە 🇮🇷 روغـن کرچک

**ڕۆنـەک** / řonek/: ئاوەڵـناو. ڕووناکیـدەر 🇮🇷 روشنایی‌بخش

**ڕۆنەکەرە** / řonekere/: ناو. نفیشـک؛ فەریکـەڕۆن 🇮🇷 کره

**ڕۆنی** / řony/: نـاو. ڕووناکی؛ ڕۆشنایی؛ ڕۆنـاهی 🇮🇷 روشنایی

▣ **ڕۆنیاچاڤ**: ڕۆنکاچاڤ؛ سۆمای چاو 🇮🇷 دید چشم

**ڕۆنیـاس** / řonyas/: نـاو. ڕوونـەریس؛ ڕوونیـاس؛ ڕوونیاسە؛ سۆرنگ؛ نووسەک؛ گیایێکی ئالیکی بە لاسکی دڕکاوی، گەڵای هێلکۆکـەیی، گوڵـی بـە کۆمەڵی زەرد و بـەری سـووری گۆشـتنەوە، کـە ڕیشووەکەی بۆ ڕەنگرێژی دەبێ 🇮🇷 روناس

**ڕۆنیاسی**[1] / řonyasî/: نـاو. ڕەنگی پەمەیی تـۆخ 🇮🇷 صورتی تیره

**ڕۆنیاسی**[2]: ئاوەڵـناو. بە ڕەنگی پەمـەیی تۆخـەوە 🇮🇷 صورتی تیره رنگ

**ڕۆنیشتن** / řonîştin/: چاوگ. ڕۆنین؛ ڕووینیشـتن: ١. دانیشتن ‹کرێکاری ماندوو کەوشەکانی داکەند و لە ژێـر دارەکـە ڕۆنیشـت› ٢. جێگـە گـرتن 🇮🇷 ١. نشستن ٢. جا افتادن

**ڕۆنیشتو** / řonîştû/: ئاوەڵـناو. ڕۆنیشتی؛ دانیشـتوو 🇮🇷 نشسته

**ڕۆنیشتەک** / řonîştek/: ناو. دۆشەک؛ دۆشـەکە 🇮🇷 تُشک

**ڕۆنیشتی** / řonîştî/: ☜ **ڕۆنیشتو**

**ڕۆنین** / řonîn/: چـاوگ. ١. ☜ **ڕۆنیشتن** ٢. ☜ **ڕوانین**

**ڕۆهن** / řohin/: ئاوەڵناو. ڕۆشن؛ ڕووناک 🇮🇷 روشن

**ڕۆهەڵات** / řohełat/: ☜ **ڕۆژهەڵات**

**ڕۆهێشتن** / řohêştin/: چاوگ. دائینان 🇮🇷 فروهشتن

**ڕۆیتن** / řoytin/: ☜ **ڕۆیشتن**

**ڕۆیشتن** / řoyiştin/: چاوگ. تێنەپەڕ. //ڕۆیشـتی؛ ـە ـ// ڕۆشـتن؛ ڕۆیـن؛ ڕۆیـین؛ ڕۆیـتن؛ مەشـین؛ چـوون؛ چـووین؛ ڕوویـن؛ لـوای؛ لـوەی؛ شـین؛ شیەی؛ هەڕن: ١. دوور بوونەوە لە بێژەر، بیسـەر یان شوێنی دیاریکراو ‹ڕۆیشتی و دڵی خۆت دا بـە لاوێکی بێگانە/ کەی قەول و قەراری ئێمە وا بوو گیانە «سوارە»› ٢. لە گەڕ کەوتن؛ بـریانی گەڕانەیـەک ‹کارەبا ڕۆیشت› ٣. لە دەست چـوون؛ لـە کـیس چوون ‹ماڵەکەشمان ڕۆیشـت!› ٤. ویستن؛ بە نیاز بوون ‹ڕۆیشت خۆی بە قیسپێکدا بدا، دەستم گـرت نەمهێشت› 🇮🇷 ١تا٤. رفتن

■ ئاوەڵناوی بـەرکاری: ڕۆیشـتوو/ چاوگی نـەرێنی: نەڕۆیشتن

**ڕۆیشـتنەوە** / řoyişt(i)newe/: چـاوگ. تێنەپـەڕ. //ڕۆیشـتیەوە؛ ـە ـ// ڕۆینـەوە: ١. گەڕانـەوە بـۆ شوێنی پێشوو ‹ڕۆیشتنەوە بۆ ماڵـی پێشـوویان› ٢. دیسانەوە ڕۆیشتن ‹ڕۆیشتنەوە بۆ بانە› ٣. کێشـانە سەر؛ لە یەکێ چوون ‹ڕۆیشتۆتەوە سەر باوکی› 🇮🇷 ١. برگشتن ٢. دوباره رفتن ٣. به کسی رفتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ڕۆیشتووەوە/ چاوگی نەرێنی: نەڕۆیشتنەوە

**ڕۆیشتو** / řoyiştû/: ئاوەڵناو. ڕۆییو؛ شیاو؛ شیای 🇮🇷 رفته

**ڕۆین** / řoyin/: چـاوگ. ڕۆیشـتن؛ چـوون ‹ئـەڕۆم، ڕێگام لێ گیراوە/ ناڕۆم، چاوکاڵ لێم تۆراوە «گۆران»› 🇮🇷 رفتن

**ڕۆینه / řoyne/**: ناو. جۆرێ هەڵپەڕکێ ≋ نوعی رقص کردی

**ڕۆینەوە / řoynewe/**: ☜ **ڕۆیشتنەوە**

**ڕۆیین / řoyîn/**: ☜ **ڕۆیشتن**

**ڕو[1] / řû/**: ناو. ١. دەموچاو؛ ڕوخسار؛ دیم ‹زوڵفت کە لە سەر ڕوو بە خەم و تابشە ئەمڕۆ/ دوودی سیەهی عوودە لە سەر عاریزی پشکۆ «نالی»› ٢. ڕووکار؛ ڕووەدا لای بەرچاو ٣. بەر؛ بەرانبەری پشت ‹پشت و ڕوو› ٤. حەیا؛ شەرم ‹پیاوێکی بێ ڕووە› ٥. دۆخی دە خۆ ڕادین ‹ڕووم نییە پێ بێژم› ٦. *[مەجاز]* حورمەت و پایە؛ جێگە و پێگە ‹پیاوێکی بێڕووە› ٧. چەم؛ چۆم ٨. خار؛ زەمینی سەخت ‹پارچە گۆشتێکە دڵی من ڕوو نییە/ ناڵەناڵی من درەنگە زوو نییە «هێمن»› ٩. بەفری سەهۆڵ بەستووی ڕەق ١٠. درو؛ درک ١١. کانزای ڕۆح ≋ ١. چهره ٢. روکار ٣. رو ۴. شرم ۵. رو ۶. قدر و منزلت ٧. رود ٨. زمین سخت ٩. برف یخبسته ١٠. خار ١١. فلز روی

▣ **ڕووی باز**: ☜ **ڕووی خۆش**

**ڕووی ترشاو**: *[مەجاز]* ڕووی ناخۆش؛ ناوچاوی تاڵ ≋ روی در هم کشیده

**ڕووی خۆش**: *[مەجاز]* ڕووی باز؛ ڕووی گەش؛ ڕوو/ ناوچاوی کراوە؛ سیمای شاد و میهرەبان ≋ روی باز

**ڕووی دەم**: ☜ **ڕووی قسە**

**ڕووی قسە**: دەمی قسە؛ ڕووی دەم؛ لایەنی وتووێژ ‹ڕووی قسەم لە ئێوەیە› ≋ روی سخن

**ڕووی کراوە**: ☜ **ڕووی خۆش**

**ڕووی گەش**: ☜ **ڕووی خۆش**

**ڕووی ناخۆش**: ☜ **ڕووی ترشاو**

⊡ **ڕو بادان**: *[کینایە]* ڕوو لێ وەرگێڕان؛ بێزاری کردن ≋ روی گرداندن

**ڕو پێ دان**: ١. خۆشەویستی و میهرەبانی نواندن ‹مەبە مەحوی بە ڕوو پێ دانی یاری عیشوەگەر مەغروور/ وەکوو دنیا سەباتێکی نییە ئیقباڵ و ئیعرازی «مەحوی»› ٢. دانە دەمەوە؛ ڕوودار کردن ≋ ١. روی خوش نشان دادن ٢. رو دادن (به کسی)

**ڕو تێکردن**: ١. ڕووی قسە لە کەسێ کردن ٢. بەرەو جێ یان کەسێ چوون ‹هەر جێگەیێ ڕووی تێکا دەیکا بە گوڵ و گوڵشەن/ دوژمن کە ئەوەی بینی، وەک جوو خەمی لێ شێوا «ئاوات»› ٣. خۆشی یان ناخۆشی هاتنە ڕێ ≋ ١. مخاطب قرار دادن ٢. رو کردن به کسی/ جایی ٣. شانس یا نکبت رو کردن

**ڕو خستن**: *[مەجاز]* ڕوونان؛ داوا کردن ‹بۆ ئەو پارەیە، ڕووی لە کێ خست؟› ≋ رو انداختن

**ڕو دان**: ١. قۆمان؛ قەومان ‹لە منڕا خۆ خەتایەک ڕووی نەداوە/ ئەدی بێمەیلی بۆ ڕووی دا لە تۆڕا؟ «هێمن»› ٢. خۆش ویستن و لاواندنەوە ‹ڕووی بدەی بە زۆڵ، ئەپەڕێتە کۆڵ «مەسەل»› ≋ ١. روی دادن؛ اتفاق افتادن ٢. روی خوش نشان دادن

**ڕو سپی کردنەوە**: *[کینایە]* ١. کاری باش و بایەخدار کردن ٢. ئابڕوو کڕینەوە ≋ ١. کار کارستان کردن ٢. اعادەی حیثیت کردن

**ڕو شکان**: *[مەجاز]* ١. خەجاڵەت بوون ٢. شەرم شکان؛ شەرم نەمان ≋ ١. از رو رفتن ٢. پُررو شدن

**ڕو شکاندن**: *[مەجاز]* ڕوو شکانن؛ خەجاڵەت کردن؛ تەریق کردنەوە ≋ از رو بردن

**ڕو شکانن**: ☜ **ڕو شکاندن**

**ڕو کرانەوە**: *[مەجاز]* ڕوو کریانەوە: ١. لاچوونی شەرم ٢. ڕوو خۆش بوون ≋ ١. رو باز شدن ٢. خوشرو شدن

**ڕو کردن**: *[مەجاز]* ١. بەرەو شوێنێ چوون

‹دووڕوویی بەسە، ڕوو دەکەمە مەیخانە/ ئەم ڕیشی سپی بە مەی بڕەنگێ جوانە «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ٢. شەرم کردن ‹ڕوو مەکە نانەکەت بخۆ!› ٣. ڕوو تێ کردن بۆ دواندن ٤. دەرخستن؛ نیشان دان ☰ ١. بە سمتی رفتن ٢. شرم کردن ٣. مخاطب قرار دادن ۴. نشان دادن

**ڕوو کردنە ڕەشەبا:** *[کینایە]* کەوتنە ڕەشەبا؛ لنگ جووت کردن؛ مردن ☰ رو بە قبلە دراز شدن

**ڕوو گرتن:** ١. سەر و چاو داپۆشین ‹چارشێوت نییە، ڕوو ناگری لە کەس/ ناموسی خۆتە پاسەوان و بەس «هێمن»› ٢. مووی دەم و چاو هەڵگرتنی ژنان ٣. توند بوونی شیری هەوێن‌کراو ☰ ١. در حجاب شدن ٢. آرایش کردن ٣. بستن شیر مایەزدە

**ڕوو لێ‌خستن:** ☜ **ڕوو لێ نان**

**ڕوو لێ نان:** *[کینایە]* ڕوو لێ خستن؛ تکا لێ کردن ☰ رو بە کسی انداختن

**ڕوو لێ وەرگێران:** ☜ **ڕوو بادان**

**ڕوو نان:** ☜ **ڕوو خستن**

**ڕوو نەهاتن:** *[مەجاز]* لە ڕوو هەڵنەهاتن؛ خەجاڵەت بوون لە وتن یان لە کردنێ کاری ‹ڕووم نایە داوای قەرزەکەم بکەم› ☰ رو نشدن

**ڕوو وەرگێران:** ☜ **ڕوو هەڵچەرخاندن**

**ڕوو هەڵچەرخاندن:** ڕوو وەرگێران؛ پشت لێ‌کردن ‹کاتێ ژنەکەی تەلاق دا، خزم و کەس ڕوویان لێ‌هەڵچەرخاند› ☰ رو برگرداندن

**ڕووی شوێنێ/ کارێ نەبوون:** شیاوی بوون لە شوێنێ یان کردنی کارێک نەبوون ‹شێخ ڕەزا پیر بووە، ڕووی مەجلیسی یارانی نییە/ تاقەتی کەشمەکەش و گەردشی شارانی نییە «شێخ ڕەزا»› ☰ لایق نبودن

**بێ ڕوو بوون:** *[کینایە]* بێ حەیا بوون؛ مانای شەرم و شوورەیی نەزانین ☰ بی‌شرم بودن

**لە ڕوو بردن:** *[کینایە]* کاڵ کردنەوە؛ خەجاڵەت کردن ☰ شرمسار کردن

**لە ڕوو چوون:** *[مەجاز]* کاڵ بوونەوە؛ خەجاڵەت بوون ☰ از رو رفتن

**لە ڕوو دامان:** شەرم کردن ‹هەر کەس هەرچی پێویستە، بێ لە ڕوو دامان و شەرم کردن داوا بکا «هێمن»› ☰ شرم کردن

**لە ڕوو هەڵنەهاتن:** ☜ **ڕوو نەهاتن**

**ڕوو-**[2]: پێشوشە. ١. لە سەر؛ لە بان ‹ڕووپەڕ؛ ڕووکێش؛ ڕووبەر› ٢. بان؛ سەر ‹ڕووبازاڕی› ☰ ١. رو- ٢. بالا

**ڕووباد / řûbad/:** ناو. ئەو ماکەوە لە ڕکەدا دایدەنێن و داوی لە دەور دەنێنەوە و ڕاوی کەوی‌تری پێ دەکەن ☰ مادە کبک شکاری

**ڕووبار / řûbar/:** ناو. ڕووبال؛ ڕوویبار: ١. ڕێڤار؛ چەم؛ چێم؛ چۆمی گەورە ‹ڕووبار بەرداشی دەبرد، پیرەژن لەپەلکەکەنگران دەگەڕا «مەسەل»› ٢. ڕووبەڕوو ☰ ١. رود؛ رودبار ٢. رو در روی

⊡ **ڕووبار بوون:** ڕووبەڕوو بوون؛ تووشی یەک هاتن ☰ روبرو شدن

**ڕووباری / řûbarî/:** ناو. ڕووباڵی؛ بەربەرەکانێ؛ بەرەنگاری ☰ مُقابله

**ڕووباز / řûbaz/:** ئاوەڵناو. ١. ڕواباز؛ ڕیایی‌کەر ٢. سەرنەگیراو؛ بەبێ میچ ‹ستادیۆمی ڕووباز› ☰ ١. ریاکار ٢. روباز

**ڕووبازاڕی / řûbazařî/:** ئاوەڵناو. بەرمێن؛ برەودار؛ بەبرەو ☰ مرغوب؛ رایج

**ڕووبازی / řûbazî/:** ناو. ڕوابازی؛ ڕیاکاری ☰ ریاکاری

**ڕووبال / řûbal/:** ناو. ١. ☜ **ڕووبار** ٢. سۆنگە؛ سەمەد ☰ ١. ☜ **ڕووبار** ٢. سبب

**ڕووباڵی / řûbalî/:** ☜ **ڕووباری**

**ڕووبڕوو / řûb(i)řû/:** ☜ **ڕووبەڕوو**

**ڕووبل / řûbl/:** ناو. یەکەی پارەی ڕووسیا ☰ روبل

**ڕووبه / řûbe/**: ناو. ڕاسا؛ سۆ؛ لا ☰ راستا

**ڕووبەخوار / řûbex(i)war/**: ناو. بەرەوژێر؛ لێژ؛ نشێو ☰ سرازیری

**ڕووبەر[1] / řûber/**: ناو. ١. بەرەلێفە؛ ئەو ڕووەی لێفە کە دەکەوێتە سەرەوە ٢. ڕووکار؛ ڕوو؛ سەلەندە؛ بەشی دەرەوەی هەر شت یان شوێنێ ‹ڕووبەری زەوی› ٣. ڕوویێ کە دەکەوێتە نێوان کۆمەڵێ هێڵ و سنوورەوە، بەتایبەت بە گوێرەی یەکەیەکی پێوانەیی (وەک: میتری چوارگۆشە، هیکتار و...) ☰ ١. روی لحاف ٢. سطح ٣. مساحت

**ڕووبەر[2]**: ئاوەڵناو. بەرانبەر ☰ برابر

**ڕووبەڕۆژ / řûbeřoj/**: ئاوەڵناو. بەربەڕۆچکە؛ خۆرگیر ☰ آفتابگیر

**ڕووبەڕوو[1] / rûbeřû/**: ناو. ڕووبڕوو؛ ڕەپاوڕوو؛ ڕووبار؛ ڕووبال ‹ڕووبەڕووم نابینم› ☰ روبرو

**ڕووبەڕوو[2]**: ئاوەڵناو. ڕووبڕوو؛ ڕەپاوڕوو؛ ڕووبار؛ بەرانبەر ‹ماڵی ڕووبەڕوومان کەس نازانێ کێن› ☰ روبرو

⊡ **ڕووبەڕوو بوونەوە**: ١. تووش بوون ‹ئەمجارەش لەگەڵیا ڕووبەڕوو بوومەوە› ٢. دۆخی هەڵتەقین؛ بەرامبەر بوون ‹نەیاندەزانی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئاوا دۆخێکدا چی بکەن›. هەروەها: **ڕووبەڕوو کردنەوە** ☰ ١و٢. روبرو شدن

**ڕووبەڕوو[2]**: ئاوەڵکار. ڕووبڕوو؛ ڕەپاوڕوو؛ ڕووبار؛ ڕوو لە ڕوو ‹بچۆ ڕووبەڕوو پێ بڵێی!› ☰ روبرو

**ڕووبەڕووی / rubeřûy/**: ئامراز. بەرابەری ‹ڕووبەڕووی یەکتر دانیشتن و قسەی خۆیان کرد› ☰ در مقابلِ؛ روبروی

**ڕووبەڕوویی / řûbeřûyî/**: ناو. بەربەرەکانێ؛ کاری لە ڕوودا وێستان ☰ مُقابله

**ڕووبەستە / řûbeste/**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* بەئەدەب و شەرمین (بۆ ئافرەت) ☰ موقّر

**ڕووبەن / řûben/**: ☜ **ڕووبەند**

**ڕووبەند / řûbend/**: ناو. ڕووبەن؛ ڕووبەنە؛ ڕووبەندە؛ پەچە؛ پێچە؛ پووشی ☰ روبنده

**ڕووبەندە / řûbende/**: ☜ **ڕووبەند**

**ڕووبەنە / řûbene/**: ☜ **ڕووبەند**

**ڕووبین / řûbîn/**: ئاوەڵناو. ڕیاباز؛ ڕواڵەتباز؛ حەفتڕەنگ ☰ ریاکار

**ڕووبینی / řûbînî/**: ناو. ١. *[کینایە]* مەرایی؛ کلکەفلێ؛ کاری ماستاو سارد کردن ٢. کاری تارا لە سەر بووک هەڵدانەوە ☰ ١. ریا ٢. عمل روبند برداشتن از سر عروس

**ڕووپاک / řûpak/**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* بەئابڕوو ☰ آبرومند

**ڕووپاما / řûpama/**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* مەرایی کەر؛ کلکەسووتەکەر. هەروەها: **ڕووپامایی** ☰ مُتملق

**ڕووپۆش / řûpoş/**: ناو. پۆشەنێ کە بەسەر جل‌وبەرگدا لەبەری دەکەن ☰ روپوش

**ڕووپەری / řûperî/**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* زۆر خوشیک؛ جوان و لەبەردڵان وەک پەری ☰ پری‌رُخ

**ڕووپەڕ / řûpeř/**: ناو. ڕووپەل؛ لاپەرە؛ لاپەڕ ‹ئاخ! دیسان ڕووپەڕێک دڕا/ لە ڕۆژئەژمێری تەمەنم! «هێمن»› ☰ صفحه (کتاب و دفتر)

**ڕووپەل / řûpel/**: ☜ **ڕووپەڕ**

**ڕووپیە / řûp(i)ye/**: ناو. یەکەی پارەی هێند، پاکستان و برێ لە وڵاتانی دراوسێیان ☰ روپیه

**ڕووپێو / řûpêw/**: ناو. کەسێ کە زەوی لە گەز دەدا ☰ مسّاح

**ڕووت[1] / řût/**: ئاوەڵناو. ڕوویت؛ ڕیت: ١. ڕووێچ؛ ڕوویس؛ ڕووس؛ بێ‌بەرگ؛ بێ‌پۆشاک ٢. *[کینایە]* نەدار و هەژار ‹هەرچەندە کە ڕووتم بە خودا مائیلی ڕووتم/ بێ‌بەرگییە عیللەت کە هەتیو مەیلی هەتاوە «نالی»› ☰ ١. لخت؛ برهنه ٢. بینوا

⊡ **ڕووت بوون**: ڕووت بوونەوە؛ ڕووتەو بوون؛ ڕووتەوە بوون: ١. بێ جلک بوون ٢. بێ پەڕ

بوون ٣. [کینایە] فەقیر بوون ☰ ١. برهنه شدن ٢. پر انداختن ٣. ندار شدن

**ڕووت بوونەوە:** ☜ **ڕووت بوون**

**ڕووت کردن:** ڕووت کرن؛ ڕووتەو کردن؛ ڕووتەوە کردن؛ ڕوویت کردن: ١. جلک لێ دارنین ٢. [کینایە] تالان کردن ٣. بێ گەڵا کردن ☰ ١. برهنه کردن ٢. غارت کردن ٣. برگ کندن

**ڕووت کردنەوە:** ١. جلک و بەرگ لێ کردنەوە ٢. [کینایە] تالان کردن ☰ ١. برهنه کردن ٢. غارت کردن

**ڕووت کرن:** ☜ **ڕووت کردن**

**ڕووتەو بوون:** ☜ **ڕووت بوون**

**ڕووتەو کردن:** ☜ **ڕووت کردن**

**ڕووتەوە بوون:** ☜ **ڕووت بوون**

**ڕووتەوە کردن:** ☜ **ڕووت کردن**

**- ڕووت[٢]:** پاشەوشە. ـــ ڕوویت؛ ـ ڕیت؛ بێ بەرگ ‹سەرڕووت› ☰ ـ برهنه

**ڕووت[٣]:** پێرۆ. ← **ڕەش‌وڕووت؛ ڕاو و ڕووت**

**ڕووتاڵ / řûtał/:** ئاوەڵناو. ١. قاقڕ؛ ڕووتەن؛ تایبەتمەندی زەوی گیا لێ نەڕواو ٢. [مەجاز] ڕووتەحل؛ ڕووترش؛ ڕووگرژ؛ دەم‌وچاوگرژ ☰ ١. بی‌پوشش گیاهی ٢. اخمو

**ڕووتان / řûtan/:** چاوگ. پۆشەمەنی لە بەر دارنان ☰ برهنه شدن

**ڕووتاندن / řûtandin/:** چاوگ. ڕووتانن: ١. پۆشاک لە بەر داکەندن ٢. پەڕ کەندن ☰ ١. برهنه کردن ٢. پر کندن

**ڕووتاندنەوە / řûtand(i)newe/:** چاوگ. تێپەڕ. //ڕووتاندتەوە؛ دەڕووتێنیتەوە؛ بڕووتێنەوە// ڕووتنایەوە: ١. ڕووتاندن؛ مووو/ پەڕ/ گەڵا پێوە نەهێشتن ٢. [کینایە] شتی زۆر لێ ساندن ☰ ١. مو/ برگ/ پر کندن ٢. دار و ندار کسی را گرفتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـــ/ چاوگی نەرێنی: نەڕووتاندنەوە

**ڕووتانن / řûtanin/:** ☜ **ڕووتاندن**

**ڕووتانەوە / řûtanewe/:** چاوگ. تێنەپەڕ. //ڕووتایەوە؛ دەڕووتێیەوە؛ بڕووتێوە// ڕووتیانەوە: ١. بێ پەڕ و پۆ مانەوە؛ لە پەڕ و پۆ کەوتن ٢. [کینایە] کەوتنە سەر ساجی عەلی ☰ ١. بی‌برگ و پوشاک شدن ٢. از هستی ساقط شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ڕووتاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەڕووتانەوە

**ڕووتانی / řûtanî/:** ناو. شوێنی ڕووتەن ‹بچینە ئەو ڕووتانییە باز دەین› ☰ جای بی‌گیاه و بوته

**ڕووتاوە / řûtawe/:** ئاوەڵناو. ١. لە پەڕ و پۆ کراو ٢. گەڵاوەریو ٣. پۆشەمەنی لە بەر داکەنراو ٤. [کینایە] تالاکراو ☰ ١. پرکنده ٢. برگ‌ریخته ٣. لُخت شده ۴. غارت شده

**ڕووتاوەوە / řûtawewe/:** ئاوەڵناو. قەڕووتی؛ داماڵراو؛ ڕووتەوەکراو (لە موو، پەڕ، گەڵا یان گۆشت) ☰ لُخت شده (از مو، پر، برگ یا گوشت)

**ڕووترش / řûtirş/:** ئاوەڵناو. [مەجاز] ڕووترشیاگ؛ ڕووتاڵ؛ ڕوو گرژ ☰ تُرشروی

**ڕووترشی / řûtirşî/:** ناو. [مەجاز] ڕووگرژی؛ ئەخم ☰ تُرشرویی

**ڕووترشیاگ / řûtirş(i)yag/:** ☜ **ڕووترش**

**ڕووتک / řûtik/:** ئاوەڵناو. ١. جۆرێ برنج ٢. جۆرێ پارچەی کەم‌نرخ کە دەکرێتە چارۆکە ☰ ١. نوعی برنج ٢. نوعی پارچەی ارزان

**ڕووتنای / řûtnay/:** چاوگ. ڕووت کردنەوە ☰ لُخت کردن

**ڕووتنایەوە / řûtnayewe/:** ☜ **ڕووتاندنەوە**

**ڕووتوڕەجاڵ / řût û řecał/:** ئاوەڵناو. ڕەش و ڕووت؛ ڕاش و ڕووت: ١. هەژار؛ نەدار ‹مەی حەلالە بۆ منی وێرانەماڵ/ بۆ منی ئاوارە و ڕووتوڕەجاڵ «هێمن»› ٢. [پلار] ڕووتەوپووتە؛ لاتی کەس‌نەناس

≡ ١. فقیر ٢. بی‌سروپا

**ڕووت‌وقووت / řût û qût/**: ئاوەڵناو. ١. هیچ دە بەردا نە ‹بنوارە بوونی ئەووەڵت و چوونی ئاخرت/ هـاتی چ ڕووت‌وقووت و هەلاتی چ لووس‌وپووس! «نـالی»› ٢. [کینایی] بێ‌هیچ دارایی ‹لە ڕووت‌وقووتـی وەک مـن ڕوو مەپۆشە/ کە وەسلی تۆیـە قـووتی عاشـقی ڕووت «نالی»› ≡ ١. لُخت مادرزاد ٢. ندار

**ڕووتە / řûte/**: ئاوەڵناو. [پلار] ڕووتـەڵ: ١. بەلـەنگاز ٢. بێ‌نموودی پووتەکـە ≡ ١. لات آسـمان‌جُـل ٢. حقیر

**ڕووتەحڵ / řûteĥl/**: ☚ **ڕووتاڵ ـ٢**

**ڕووتەخت / řûtext/**: ئاوەڵـناو. [مەجاز] بـێ‌شـەرم و ڕووهەڵماڵاو ≡ بی‌حیا

**ڕووتەڵ / řûteł/**: ☚ **ڕووتە**

**ڕووتەڵە / řûtełe/**: ئاوەڵـناو. [پلار] ١. پووتەکـەی بێ‌نموود ٢. تووک‌لێ‌وەریو ≡ ١. حقیر ٢. موریختە

**ڕووتەن / řûten/**: ئاوەڵـناو. ڕویال؛ ڕووتەنی؛ ڕووتاڵ؛ ڕوویتان؛ ڕوویتانە؛ قاقڕ؛ تایبەتمەندی زەوینێ کە گیای لێ نەڕواوە ‹ئەو کاتەی پرشە و تنۆکی/ دوانی لـێم ئـەدا/ قاقـڕ و ڕووتەنـی بیسـتنم/ بـە ئـاوی دەنگەکەی شین ئەبێ «شێرکۆ»› ≡ بی‌گیاه (زمین)

**ڕووتەنک / řûtenik/**: ئاوەڵـناو. ١. [مەجاز] بەشـەرم؛ خەجاڵەتی ٢. تەنک؛ ڕوون؛ زەلال ≡ ١. خجالتی ٢. شفّاف

**ڕووتەنی / řûtenî/**: ☚ **ڕووتەن**

**ڕووتەوپووتە / řûte w pûte/**: ئاوەڵناو. [پلار] لاپۆتی؛ ڕەجالە ≡ رجالە

**ڕووتەوەبوو / řûtewebû/**: ئاوەڵناو. ١. جلک لە بـەر نـەماو ٢. [کینایـە] تـالان‌بـوو ≡ ١. لُخـت‌شـدە ٢. غارت‌شدە

**ڕووتەوەکراو / řûtewek(i)raw/**: ئاوەڵناو. ١. جلـک لـە بـەر داماڵـداراو ٢. [کینایـە] تـالانکراو ≡ ١. لُخت‌شدە (از لباس) ٢. غارت‌شدە

**ڕووتی[1] / řûtî/**: نـاو. ١. بـێ‌بـەرگی ٢. [کینایـە] فەقیری؛ هەژاری ≡ ١. لُختی ٢. نداری

**ڕووتی[2]**: ئاوەڵناو. ڕووت؛ پەتی؛ تـەنیا؛ بـێ شـتێکی ڕیکە ‹نانی ڕووتی› ≡ خالی

**ڕووتی[3]**: ئاوەڵـکار. بـە خاڵـی؛ بـەبێ پێخـۆرەوە ‹گۆشتەکەی ڕووتی خوارد!› ≡ خالی ـ خالی

**ڕووتیانەوە / řûtyanewe/**: ☚ **ڕووتانەوە**

**ڕووتیایەوە / řûtyayewe/**: ☚ **ڕووتانەوە**

**ـ ڕووتێن / -řûtên/**: پاشەوشـە. ڕووتکـەرەوە ‹خەڵک‌ڕووتێن› ≡ غارتگر

**ڕووچک / řûçik/**: ناو. دەم‌وچاو؛ ڕوو ≡ چهره

**ڕووچن / řûçin/**: ناو. ڕووچین؛ ئەو بەشە لە ماڵ کە لە سەر بناغەوە دروست دەکرێ ≡ روبنا

**ڕووچین / řûçîn/**: ☚ **ڕووچن**

**ڕووخار / řûxar/**: ئاوەڵناو. [مەجاز] ١. شـەرمەزار ٢. مل‌کەچ ≡ ١. شرمسار ٢. گردن‌کج

**ڕووخـان / řûxan/**: چـاوگ. تێنەپـەڕ. //ڕووخـای؛ دەڕووخێی؛ بڕووخێ// ڕووخیان؛ ڕخیان: ١. ڕمـان؛ ڕمیان ‹دەری تۆ کەعبە بوو حـاجی تـەوافی کـرد و نـەیزانی/ چ قـەوما، کەعبـە کـەچ بـوو؟ مەسجیدولئەقسـایە ڕووخـاوە؟ «حـاجی قـادر»› ٢. [کینایە] هەڵوەشان؛ لێک بەربوون ≡ ١. فـروریختن ٢. فروپاشیدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: ڕووخـاو/ چـاوگی نـەرێنی: نەڕووخان

**ڕووخاندن / řûxandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //ڕووخانـدت؛ دەڕووخـێنی؛ بڕووخێنـە// ڕووخـانن؛ ڕخـانن: ١. ڕمانن؛ ڕماندن ‹کۆمەلان هێزی تۆڵـە پێـک دێـنن/ حوکمی دۆلار و شا ئەڕووخێنن «قانع»› ٢. [کینایە] هەڵوەشاندن؛ لێک‌هەڵوەشاندن ≡ ١. فرو ریختن ٢. فروپاشاندن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: ـــ/ چـاوگی نـەرێنی: نەڕووخاندن

**ڕووخانن / řûxanin/**: ☜ **ڕووخاندن**

**ڕووخانە / řûxane/**: ناو. ١. چـۆم؛ چـێم؛ ڕۆ ٢. بەست؛ بەستێن ≡ ١. رودخانه ٢. بستر رودخانه

**ڕووخاو / řûxaw/**: ئاوەڵناو. ڕخیاو: ١. ڕمیاو؛ ڕمیاگ ٢. هەڵوەشاو؛ لێک‌بەربوو ≡ ١. فروریخته ٢. فروپاشیده

**ڕووخڵاکۆر / řûx(i)łakor/**: ☜ **ڕیخۆڵەکوێرە**

**ڕووخورۆک / řûxurok/**: ئاوەڵناو. دەم و چاو گرووێ ≡ آبله‌رو

**ڕووخوێنی / řûx(i)wênî/**: ناو. کاری لە ڕوو خوێندنەوەی بابەتێک لە ڕووی نووسراوەوە ≡ روخوانی

**ڕووخۆش / řûxoş/**: ئاوەڵناو. خۆشڕوو؛ دەم‌بەپێکەنین ≡ خوشرو

**ڕووخۆشی / řûxoşî/**: ناو. گەشی ≡ خوشرویی

**ڕووخە[1] / řûxe/**: ناو. قوپاوی؛ قوپیاگی ≡ فرورفتگی

**ڕووخە[2]**: ئاوەڵناو. ڕووخەک: ١. لە سەر ڕووخان؛ نزیک بە ڕمان ٢. ڕۆچوو؛ قوپاو ≡ ١. نزدیک به فروریختن ٢. فرورفته

**ڕووخەک / řûxek/**: ☜ **ڕووخە[2]**

**ڕووخیان / řûxyan/**: ☜ **ڕووخان**

• **ڕووخێن / -řûxên/**: پاشوشە. ڕووخێنەر ‹من نیم ئەوە، هەر خۆیەتی کۆڵنەدەر/ کۆنەڕووخێن، بنیاتی تازە دانەر «گۆران»› ≡ فروریخته شدن

**ڕووخێنران / řûxênran/**: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //ڕووخێنرای؛ دەڕووخێنری؛ بڕووخێنرێ// کەوتنە ڕووخاندنەوە ≡ فروریخته شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ڕووخێنراو/ چاوگی نەرێنی: نەڕووخێنران

**ڕوودار / řûdar/**: ئاوەڵناو. ١. بە قەدر و حورمەت ٢. بوێر؛ بێ‌ترس ٣. *[پلار]* ڕوار؛ ساواز؛ سایواز؛ ڕێلاس؛ ڕێلاس؛ قەیتوول؛ قوڵتەش * هەروەها: **ڕووداری** ≡ ١. مُحترم ٢. نترس ٣. پُررو

**ڕوودارانە / řûdarane/**: ئاوەڵکار. بە بێشەرمییەوە ≡ بیشرمانه

**ڕووداماڵاو / řûdamaław/**: ☜ **ڕووداماڵراو**

**ڕووداماڵراو / řûdamałraw/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ڕووداماڵاو؛ ڕووداماڵیاگ؛ ڕووسەخت؛ ڕووهەڵماڵاو؛ ڕووهەڵماڵدراو؛ ڕووهەڵماڵراو؛ بێ‌شەرم و حەیا ≡ بی‌شرم

**ڕووداماڵیاگ / řûdamałyag/**: ☜ **ڕووداماڵراو**

**ڕووداو / řûdaw/**: ناو. ڕوودای؛ دەگمە؛ پێشهات؛ بویەر؛ ئەوەی بەدیهاتووە یان ئەنجام دراوە ‹ئەم ڕووداوە یەکەم زەبری توند بوو کە وە هەستی ناسکی منداڵانەی من کەوت «هێمن»› ≡ رویداد

**ڕوودای / řûday/**: ☜ **ڕووداو**

**ڕوودرژ / řûdirj/**: ئاوەڵناو. ڕووترش؛ ڕووگرژ ≡ اخمو

**ڕوودڵ / řûdił/**: ناو. سەردڵ؛ گرفت؛ نەخۆشی قورس بوون و داهێزانی زگ لە بەر پڕی گەدە ≡ رودل

**ڕوودۆز / řûdoz/**: ☜ **ڕۆز**

**ڕوودەربایس / řûderbayis/**: ئاوەڵناو. ڕوودەربایست؛ ڕووتەنک ≡ کمرو؛ خجالتی

**ڕوودەربایست / řûderbayist/**: ☜ **ڕوودەربایس**

**ڕوودەربایستی / řûderbayistî/**: ☜ **ڕوودەربایسی**

**ڕوودەربایسی / řûderbaysî/**: ناو. ڕوودەربایستی؛ ڕوودەروایسی؛ لە ڕووداماوی: ١. دۆخی هەست بە شەرم کردن لە بەجێ نەهێنانی داوای کەسێک ‹لە تەک ئەوا ڕوودەربایسیم هەس› ٢. کەم‌ڕوویی؛ شەرمنی ≡ ١و٢. رودربایستی

**ڕوودەروایسی / řûderwaysî/**: ☜ **ڕوودەربایسی**

**ڕوودێن / řûdên/**: ناو. میزدان؛ میزەڵدان ≡ مثانه

**ڕووڕاست / řûřast/**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* ١. بێ‌پەردە؛ بێ‌ڕووبینی؛ هەربی؛ وەکات؛ ڕەپ و ڕاست؛ خاوەن ڕاشکاوی و ڕاستی لە دەربڕینی قسە ٢. ڕاست‌بێژ؛ ڕاستگۆ ≡ ١. رُک و صریح ٢. صادق

**ڕووڕاستی / řûřastî/**: ناو. ڕاستی ☰ روراستی

**ڕووڕەش / řûřeş/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ١. نـاوزڕاو؛ بـێ ئابـڕوو ٢. فـەدیکار؛ شـەرمەزار؛ خەجاڵـەت. بەرانبەر: **ڕووچەرمگ** ☰ ١و٢. روسیاه

**ڕووڕەشی / řûřeşî/**: ناو. *[مەجاز]* ١. بێ ئابـڕوویی ٢. خەجاڵەتی؛ شـەرمەزاری. بەرانبـەر: **ڕووچـەرمگی** ☰ ١و٢. روسیاهی

**ڕووزە / řûze/**: ئاوەڵناو. ڕووشە: ١. کەچ و کروچ ٢. هاوڵـەڕوو؛ دەموچـاو ئـاولاوی ٣. پەڵـە ـپەڵـە ژەنگاوی ☰ ١. فرسوده ٢. آبله‌گون ٣. زنگ‌زده

**ڕووزەر / řûzer/**: ☜ **ڕووزەرد**

**ڕووزەرد / řûzerd/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ڕووزەر؛ شەرمەزار. بەرانبەر: **ڕووسوور** ☰ شرمنده

**ڕووزەردی / řûzerdî/**: ناو. *[مەجاز]* خەجاڵـەتی؛ شەرمەزاری ‹لـە خـەوفی تەلعـەتی ڕۆژ هـەروەکوو شێت/ بە ڕووزەردی هەلات و کەوتە کێوان «نالی»›. بەرانبەر: **ڕووسووری** ☰ شرمندگی

**ڕووزەری / řûzerî/**: ناو. سـەوزەڕەنگ؛ ئەسمـەر؛ پێستی سپی هێندێک تاریک ☰ سبزه‌رو

**ڕووزەڵـە / řûzełe/**: ئاوەڵناو. ڕووزەی گچکـە و بێنموود ☰ فرسوده‌ی زنگ‌زده

**ڕووژ / řûj/**: ☜ **ڕۆژـ١**

**ڕووژشمار / řûjş(i)mar/**: ☜ **ڕۆژمێر**

**ڕووژە / řûje/**: ناو. ئەڵماس ☰ الماس

**ڕووس / řûs/**: ئاوەڵناو. ١. ڕویس؛ ڕووت؛ بـێبـەرگ ٢. تیژ لە چێژەدا ٣. خەڵکی وڵاتی ڕووسیە ☰ ١. لُخت ٢. تُندمزه ٣. روسی؛ اهل روسیه

**ڕووسارد / řûsard/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ١. گوێنـەدەر؛ لاسار ٢. بێناز؛ لارەمل ‹کچی بێچارە هەتا لە ماڵـە بابیشە هەر ڕووساردە› ☰ ١. بی‌مبالات ٢. مظلوم

**ڕووساردی / řûsardî/**: ناو. *[مەجاز]* گـوێنـەدەری؛ لاساری ☰ بی‌مبالاتی

**ڕووسپی / řûspî/**: ناو. حیز؛ سۆزمانی؛ خۆفرۆش ☰ روسپی

**ڕووسپی / rûsipî/**: ئاوەڵناو. سـەربەرز؛ بەئابـڕوو ☰ روسفید؛ آبرومند

**ڕووسپییەتی / řûspîyetî/**: ناو. ١. *[مەجاز]* خـوێنی نیشانەی کیژ بوونی بووک ٢. حیزی ☰ ١. خـون بکارت عروس ٢. فاحشگی

**ڕووسکە / řûske/**: ناو. گوڵەجاف؛ گوڵـەجەفاکێش؛ گوڵێکە بۆ ئازارەباریکە بە کەڵکە ☰ گل خیار؛ گـل کارگر

**ڕووسڵ / řûsił/**: ئاوەڵناو. شەرمین؛ فرێت ☰ باحُجب و حیا

**ڕووسوور / řûsûr/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* سـەربەرز و بەئابڕوو ‹لەبەر قاپی مەحەببەت ئەو خودا پێداوەیـە ڕووسوور/ حەزینە، دیدە پڕ ئەسرینە، دڵ خوێنینـە، ڕووزەردە «مـەحوی»›. بەرانبـەر: **ڕووزەرد** ☰ روسفید

**ڕووسووری / řûsûrî/**: ناو. ١. خوێنی نیشـانەی کـچ بـوون کـە بـە خـامێکی سـپییەوە لـە ماڵـی زاوا دەنێرێتـەوە بـۆ ماڵـی بـابی بـووک ٢. *[مەجاز]* ئابڕوومەنـدی. بەرانبـەر: **ڕووزەردی** ☰ ١. خـون بکارت عروس ٢. آبرومندی

**ڕووسە / řûse/**: ناو. بنخەرمان؛ ئەو نەختە دەخڵ و دانە لـە خـەرمان دەمێنێتـەوە و لەتـەچن کـۆی دەکەنـەوە ☰ باقیمانـدەی خـرمن کـە فقـرا جمـع می‌کنند

**ڕووسەخت / řûsext/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ١. سەربڵـند؛ سەربەرز ٢. ☜ **ڕوودامالڕاو** ☰ ١. سـربلند ٢. ☜ **ڕوودامالڕاو**

**ڕووسەری / řûserî/**: ناو. دەسماڵی سەر؛ سەرپۆشی ژنانە ☰ روسری

**ڕووسیا / řûs(i)ya/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ١. شـەرمەزار؛ خەجاڵەت ‹باوکت خەجاڵەت، دایکت ڕووسیا/ تۆیان لە من کرد بۆ ماڵی دنیا «فولکلـۆر»› ٢. ئابـڕووتکاو؛

ناوزڕاو. هەروەها: **ڕووسیایی** 🇮🇷 ١. شرمسار ٢. رسوا

**ڕووش**[1] / řûş/: ناو. ڕوویش: ١. خاشە؛ کیر؛ کێڕ؛ شاخ؛ قرنج؛ مەڕت؛ ڕووک؛ خراش؛ شوێنەوارێ کە لە کێشرانی شتێکی تیژ بە سەر ڕوویەکدا بەدی دێ ‹دار خەیزەرانێکم دیت لە باخچەیەکدا، پتر لە شازدە میتر بەرز و قەف ـ قەف، کەسک، قەت رووشێکی تێدا نەبوو «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. جۆرێ بەری دارمازوو ٣. تەڵەزمی دار ٤. ڕیشوو؛ تاڵی کەنارەی پارچە 🇮🇷 ١. خراش ٢. نوعی ثمر مازوج ٣. تراشەی چوب ۴. شَنگُلەی کنارەی پارچە

**ڕووش**[2]: ئاوەڵناو. ڕوویش: ١. شەڕانی و نەگونجاو ٢. درشت؛ زبر ٣. ئاوڵاوی؛ ڕووزە 🇮🇷 ١. تندخوی ٢. خشن؛ زبر ٣. آبلەگون

⊡ **ڕووش هەڵاتن:** تووڕە بوون و خۆ پف دان (پشیلە) 🇮🇷 عصبانی شدن و پُف کردن (گربه)

**ڕووشان** / řûşan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //ڕرووشای؛ دەڕووشێی؛ بڕووشێ// ڕووشیان؛ ڕووشین؛ ڕۆشان؛ ڕووکیان؛ ڕووکان؛ مەڕتان؛ کیڕیان؛ شوێنی کێشرانی شتێکی تیژ بە سەر ڕووبەرێ، بەتایبەت پێستدا ‹ئەژدەهاک! کون بڕە، سەختە زیندانت،/ ناڕووشێ بە بڕبەن بەنی گرانت! «گۆران»› 🇮🇷 خراش برداشتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ڕووشاو/ چاوگی نەرێنی: نەڕووشان

**ڕووشاندن** / řûşandin/: چاوگ. تێپەڕ. //ڕرووشاندت؛ دەڕووشێنی؛ بڕووشێنە// ڕوویشاندن؛ ڕووکاندن؛ مەڕتاندن؛ کیڕاندن ‹دەستمی ڕووشاند› 🇮🇷 خراشیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـــ/ چاوگی نەرێنی: نەڕووشاندن

**ڕووشاو** / řûşaw/: ئاوەڵناو. ڕووشیاو؛ ڕوویشای؛ ڕشاو؛ ڕووکاو؛ مەڕتاو؛ کیڕیاگ ‹دەستم ڕووشاوە› 🇮🇷 خراشیده

**ڕووشاوی** / řûşawî/: ناو. ڕووشیاوی؛ ڕووکاوی؛ مەڕتاوی؛ کیڕیاگی ‹شوێنی ڕووشاوی دەستم دیارە› 🇮🇷 خراشیدگی

**ڕووش ـ ڕووش** / řûş řûş/: ئاوەڵناو. درژ و پڕکێڕ 🇮🇷 خشن و پرخراش

**ڕووشکاو** / řûş(i)kaw/: ئاوەڵناو. کەچەتڕێن؛ بە شەرماخراو 🇮🇷 از رو رفتە؛ شرمندە شدە

**ڕووشکنای** / řûş(i)knay/: چاوگ. ١. ڕووشاندن ٢. وەشاندنەوە 🇮🇷 ١. خراشیدن ٢. توزیع کردن

**ڕووشکیای** / řûş(i)kyay/: چاوگ. ١. ڕووشان ٢. وەشانەوە؛ دابەش‌بوونەوە 🇮🇷 ١. خراش برداشتن ٢. توزیع شدن

**ڕووشکێن** / řûş(i)kên/: ئاوەڵناو. تەریق‌کەر؛ تەریق‌کەرەوە. هەروەها: **ڕووشکێنی** 🇮🇷 از رو بَر

**ڕووشن** / řûşin/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* بەدفەڕی شەڕانی 🇮🇷 ستیزەجو

**ڕووشنای** / řûşnay/: چاوگ. ڕووشاندن 🇮🇷 خراشیدن

**ڕووشە**[1] / řûşe/: ناو. ١. ڕووش؛ خراش ٢. کارەسات؛ چۆرتم؛ لێقەوماوی؛ بەڵا و بەرسەرهاتی خراپ 🇮🇷 ١. خراش ٢. مُصیبت

**ڕووشە**[2]: ☜ **ڕووزە**

**ڕووشەر** / řûşer/: ☜ **ڕووشێن**

**ڕووشیان** / řûşyan/: ☜ **ڕووشان**

**ڕووشیاو** / řûşyaw/: ☜ **ڕووشاو**

**ڕووشیاوی** / řûşyawî/: ☜ **ڕووشاوی**

**ڕووشیای** / řûşyay/: چاوگ. ڕووشان 🇮🇷 خراش برداشتن

**ڕووشین** / řûşîn/: ☜ **ڕووشان**

**ڕووشێن** / řûşên/: ئاوەڵناو. ڕووشەر 🇮🇷 خراشندە

**ڕووڤ** / řûv/: ناو. ڕوڤک؛ تووکەبەر 🇮🇷 موی زهار

**ڕووڤی** / řûvî/: ناو. ١. ☜ **ڕیخۆڵە** ـ١ ٢. ☜ **ڕێوی**[1]ـ١

⊡ **ڕووڤی ڕەش:** ڕووڤی ستور؛ ڕیخۆڵەی گەورە 🇮🇷

ڕودەی بزرگ

**ڕوقی زراڤ:** ڕیخۆڵەی بووچک ⚑ رودەی کوچک

**ڕوقی ستون:** ☜ **ڕوقی ڕەش**

**ڕوقی کون:** ☜ **ڕیخۆڵەکوێرە**

**ڕوقایم / řûqayim/:** ئاوەڵناو. *[پلار]* بێشەرم لە قسەدا ⚑ دریده؛ گُستاخ

**ڕوقەرمچی / řûqerm(i)çî/:** ئاوەڵناو. بە چرچاوی چرچ و لۆچ ⚑ رُخسار پرچین و چروک

**ڕوک / řûk/:** ناو. ١. چروچاو؛ دەموچاو؛ ڕوخسار ٢. ڕووش؛ ڕووشە؛ خاشە ⚑ ١. چهره ٢. خراش

**ڕوکار[1] / řûkar/:** ناو. ١. نما؛ دەمکار؛ لای دەرەوەی خانووبەرە ‹ڕووکاری ماڵەکەی بەردی سپییە› ٢. ئەو کەرستەگەلە (وەک: ئاجۆر و بەرد و ...) کە نمای پێ دروست دەکرێ ‹ڕووکارەکەی کردۆتە بەرد› ٣. توێخی سەرەوە ‹ڕووکاری زەوین› ٤. کاری کراوی دیار ‹ئەم جنسە ڕووکار و ژێرکاری یەک نین› ⚑ ١. نما ٢. روکار (ساختمان) ٣. سطح؛ رویه ۴. نمود بیرونی کار

**ڕوکار[2]:** ئاوەڵناو. ١. دیار؛ بەرچاو؛ دیوی دەرەوە ‹سیمکەشی ڕووکار› ٢. بەرانبەر؛ هەمبەر؛ هەنداو ⚑ ١. روکار ٢. مُقابل

**ڕوکاری / řûkarî/:** ناو. نماکاری؛ کاری سەر بە دەرەوەی خانووبەرە ‹ڕووکاری خانووەکەمان زۆری خایاند› ⚑ روکاری

**ڕوکان / řûkan/:** چاوگ. تێنەپەڕ. //ڕووکای؛ دەڕووکێ؛ بڕووکێ// ڕووکیان؛ ڕووکیای؛ ڕووشان؛ داڕووشان ⚑ خراش برداشتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ڕووکاو/ چاوگی نەرێنی: نەڕووکان

**ڕوکاندن / řûkandin/:** ☜ **ڕوشاندن**

**ڕوکانن / řûkanin/:** چاوگ. ڕووشاندن؛ داڕووشاندن ⚑ خراشیدن

**ڕوکاو / řûkaw/:** ☜ **ڕوشاو**

**ڕوکاوی / řûkawî/:** ☜ **ڕوشاوی**

**ڕوکراوە / řûk(i)rawe/:** ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ١. ڕووخۆش ٢. شەرمنەکەر لە خەڵک بۆ قسە و ڕووبەڕوو بوون ⚑ ١. خوشرو ٢. چشم و گوش بازشده

**ڕوکنای / řûknay/:** چاوگ. ڕووکاندن ⚑ خراشیدن

**ڕوکە / řûke/:** ناو. ڕووش؛ داڕووش ⚑ خراش

**ڕوکەش / řûkeş/:** ناو. ڕووکێش؛ دیمە؛ چیمکۆ؛ ئەوەی بۆ داپۆشینی دیوی دەرەوەی شتێ و زیاتر بۆ پاراستن یان ڕازاندنەوەی دە کار کراوە ⚑ روکش

**ڕوکەن / řûken/:** ئاوەڵناو. ڕووخۆش؛ دەمبەپێکەنین ⚑ خندەرو

**ڕوکیاگ / řûkyag/:** ئاوەڵناو. شاخاو؛ ڕووشاو ⚑ خراشیده

**ڕوکیان / řûkyan/:** ☜ **ڕوکان**

**ڕوکیای / řûkyay/:** ☜ **ڕوکان**

**ڕوکێش / řûkêş/:** ☜ **ڕوکەش**

**ڕوکێشە / řûkêşe/:** ☜ **ڕکێشە**

**ڕوگ / řûg/:** ناو. دۆشاو؛ دس؛ شیلاو؛ شیلەی تریی کولاو ⚑ شیرەی انگور

**ڕوگر / řûgir/:** ئاوەڵناو. شەرمێون؛ بەحەیا ⚑ محجوب

**ڕوگرتی / řûgirtî/:** ئاوەڵناو. دەڵەمە؛ بەندهاتوو (شیر) ⚑ دلَمه؛ بسته (شیر)

**ڕوگرژ / řûgirj/:** ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ڕووتاڵ؛ ڕووترش ‹کەس لەو ڕووگرژتر، لووتبەرزتر، ناحەزتر، خوێڕی و بێکارەتر، پیس و پۆخڵتر، زمانشڕتر نەبووە و نابێتەوە «هەژار، چێشتی مجێور»› ⚑ اخمو

**ڕوگرژی / řûgirjî/:** ناو. مۆڕی؛ مۆنی؛ مرووز ⚑ اخم

**ڕوگوشاد / řûguşad/:** ئاوەڵناو. *[کینایە]* خۆشڕوو؛ ڕووخۆش؛ دژی مر و مووچ ⚑ بشاش

**ڕوگە / řûge/:** ناو. ١. *[ئیسلام]* قیبلە؛ شوێنێ کە

موسولمانان بۆ نوێژ خوێندن ڕووی تێدەکەن ٢. *[کینایە]* شوێنی پیرۆز و زۆر خۆشەویست بۆ کەسێ یان تاقمێ ‹کە تۆ بۆ مز لە ناو مزگەوتی، کوردستانە ڕووگەی من/ کە تۆ دەرویشی زەرگ و مەرگی، من بێهایوهوو کوردم «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☒ ١. قبلە ٢. قبلەگاه

**ڕوگەش / ř̂ûgeş/:** ئاوەڵناو. *[کینایە]* ڕووخۆش؛ دەمبەپێکەنین ☒ خوشرو

**ڕوگیر / ř̂ûgîr/:** ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ١. تۆراو؛ تۆریاگ؛ زویر ٢. تەریقەوەبوو؛ تەریقەوبوو؛ شەرمەزار ٣. تایبەتمەندی ئەوی کەوتۆتە ناو ڕوودەربایستی ☒ ١. قهرکردە ٢. خجالتزدە ٣. در معذوریت افتادە

**ڕوگیری / ř̂ûgîrî/:** ناو. *[مەجاز]* تەریقی؛ شەرمەزاری ☒ خجلت

**ڕول / ř̂ûl/:** ناو. ڕوولک؛ ڕوویل؛ کەرکوژە؛ ژالە؛ ژالک؛ ژەلە؛ ڕیل؛ ڕویل؛ لوولک؛ لۆرک؛ لوێر؛ لوور؛ لوورک؛ قرژانک؛ قەرجلگ؛ دارچکێکی جوانی ژەهراوی، گەلا ئەستوور، پڕ لەق و پۆی چەترئاسایە ☒ خرزهرە

**ڕولک / ř̂ûlik/:** ناو. ١. ☜ **ڕول** ٢. بەرزەچڕ؛ جرجڕە؛ سیسرە؛ مێروویەکی وەک کولەیە شەوانە هەرا دەکا ☒ ١. ☜ **ڕول** ٢. جیرجیرک

**ڕولکەن / ř̂ûlken/:** ئاوەڵناو. دەمبەپێکەنین؛ ڕووخۆش؛ ڕووگەش ☒ گشادەروی

**ڕوڵە / ř̂ûłe/:** ☜ **ڕۆڵە**

**ڕوماڵ / ř̂ûmał/:** ناو. ١. ماکێکی لینج (وەک چەرمێنەی هێلکە) کە پێش لە برژاندنی نان و شیرینی، بۆ جوان کردنی، پێیدا دەساون ٢. کاری مالینەوە و کۆکردنەوە ☒ ١. رومال ٢. عمل روفتن و گردآوری کردن

⊡ **ڕوماڵ کردن:** کۆ کردنەوە و گواستنەوەی هەواڵ و دەنگوباس ☒ پوشش و انتقال دادن خبر

**ڕومۆن / ř̂ûmon/:** ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ڕووناخۆش؛ ڕووگرژ؛ ناوچاوانترش ☒ تُرشرو

**ڕومەت / ř̂ûmet/:** ناو. ١. دیم؛ دەموچاو ٢. حورمەت؛ قەدر؛ وەج ☒ ١. رُخسار ٢. احترام

⊡ **ڕومەت گرتن:** ١. قەدر گرتن؛ ڕێز لێنان ٢. هەنیە هەڵگرتن ☒ ١. احترام گذاشتن ٢. مو چیدن از صورت؛ اصلاح کردن

**ڕومەتگیر / ř̂ûmetgîr/:** ناو. ١. هەنیەهەڵگر؛ ئەوەی کاری هەڵگرتنی مووی ڕوومەتی ژنانە ٢. مووچن؛ مووکێش؛ ئامرازی موو هەڵگرتن ☒ ١. آرایشگر (زنانە) ٢. مووچین

**ڕومیزی / ř̂ûmîzî/:** ناو. چنراوێ لە پارچە، مشەما یا نایلۆن بۆ داپۆشاندنی سەر مێز ☒ رومیزی

**ڕون[1] / ř̂ûn/:** ناو. ☜ **ڕۆن**

⊡ **ڕون کرن:** ڕۆن کردنە ناو شێو؛ ڕۆن دە چێشت کردن ☒ روغن ریختن در غذا

**ڕون[2]:** ئاوەڵناو. ١. ڕۆشن؛ ڕووناک ‹تاو هەلات و دنیاکە ڕوون بۆوە› ٢. زەلال؛ بێلێلایی ‹کانییەکی ڕوونی بەر تریفەی مانگەشەو/ لە بنیا بلەرزێ مرواریی زیخ و چەو «گۆران»› ٣. ئاشکرا؛ دیار ‹گیان بەرەو کوێ دەفڕێ ڕوون نییە بۆم/ تۆ بلەی بچتەوە لای باوەهەڵۆم؟ «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ٤. تەڕ؛ شل؛ بەرامبەری خەست ‹دڵ شووشەیە، جەرگە بۆتە پالوێن/ ڕوون بێتەوە خەستە بادەیی خوێن «هەژار؛ *مەموزین*»› ٥. *[مەجاز]* خۆش؛ خۆشحاڵ ‹بە دیتنی زۆر دڵم ڕوون بۆوە› ☒ ١. روشن ٢. شفاف ٣. آشکار ۴. رقیق ۵. شادمان

⊡ **ڕون بونەوە:** ١. ڕووناک بوونەوە؛ ساف و زەلاڵ بوونی لێڵ ٢. ئاشکرا بوونی نهێنی کاری ☒ ١. شفاف شدن کدر ٢. روشن شدن

**ڕون کردنەوە:** دەرخستنی مەبەستی نەزانراو ☒ روشن و واضح کردن؛ توضیح دادن

**ڕوناخۆش / ř̂ûnaxoş/:** ☜ **ڕومۆن**

**ڕوناس / ř̂ûnas/:** ناو. تەختەکالۆس؛ جۆرێ

مۆریانە ☰ نوعی موریانە

**ڕوناک** / řûnak/: ئاوەڵناو. ڕوون؛ ڕۆشن ☰ روشن

⊡ **ڕوناک بونەوە** ١. ☜ **ڕون بونەوە ـ١** ٢. ئاشکرا بوون و دەرکەوتنی ڕاستی ڕووداو ☰ ١. ☜ **ڕون بونەوە ـ١** ٢. روشن شدن قضیە

**ڕوناک کردنەوە** ١. ڕۆشنایی دان بە تاریکی ٢. دەرخستنی ڕاستی ڕووداو یان مەبەست ☰ ١. روشن کردن ٢. روشن کردن مسألە

**ڕوناکایی** / řûnakayî/: ☜ **ڕوناکی**

**ڕوناکبیر** / řûnakbîr/: ☜ **ڕۆشنبیر**

**ڕوناکی** / řûnakî/: ناو. ڕۆژناهی؛ ڕۆژنایی؛ ڕووناکایی؛ ڕووناهی؛ ڕوونایی؛ ڕۆناهی؛ ڕۆشناکی؛ ڕۆنکایی؛ ڕەنک ☰ روشنایی

**ڕوناکیدەر** / řûnakîder/: ئاوەڵناو. ڕووناهیدەر؛ ڕۆنەک؛ درەخشان؛ بەدرەوشە ☰ درخشان

**ڕونان** / řûnan/: چاوگ. دانیشتن؛ نیشتن ☰ نشستن

**ڕوناندن** / řûnandin/: چاوگ. بێخەم کردن؛ خاترجەم کردن ☰ خاطرجمع کردن

**ڕوناهی** / řûnahî/: ☜ **ڕوناکی**

**ڕوناهیدەر** / řûnahîder/: ☜ **ڕوناکیدەر**

**ڕونایی** / řûnayî/: ☜ **ڕوناکی**

**ڕونبێژ** / řûnbêj/: ☜ **ڕونپێژ**

**ڕونپێژ** / řûnpêj/: ناو. تاوە؛ ڕەمبێژ؛ ڕوونبێژ؛ ڕەمپێشک؛ ناولنگان؛ ئاخلەوێک ☰ تاوە

**ڕوندان** / řûndan/: ☜ **ڕۆندان**

**ڕونشتاندن** / řûniştandin/: چاوگ. دانیشاندن ☰ نشاندن

**ڕونشتەک** / řûniştek/: ناو. سەندەڵی؛ سەنگەڵی؛ ئەسکەمل ☰ صندلی

**ڕونکی** / řûn(i)kî/: ناو. پاڵووی دەگەڵ کورتان ☰ رانکی

**ڕونوس** / řûnûs/: ناو. لەبەر نووسراو ☰ رونویس

**ڕونوسی** / řûnûsî/: ناو. کار و ڕەوتی لە بەر نووسینەوە؛ فەرکان ☰ رونویسی

**ڕونە** / řûne/: ناو. دەمی باریکی تیخ ☰ لبەی تیغ

**ڕونەرم** / řûnerm/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* شەرمێون ‹لەو ڕوخ گوڵگوونە دیری حەسرەت ماچێ دڵم/ بەسکە ڕوونەرمم خودایا، تاو ئیبرازم نییە «تەمکین»› ☰ خجالتی

**ڕونەریس** / řûnerîs/: ☜ **ڕۆنیاس**

**ڕونەک** / řûnek/: ناو. قنگ؛ جێگەی دانیشتن لە ئەندامدا ☰ نشیمنگاه

**ڕونی** / řûnî/: ناو. ١. ئاشکرایی ‹نەبوونی ڕوونی لە باسی داهاتی نەوتدا› ٢. تەڕی؛ دۆخی تراو بوون ٣. ڕۆشنی ‹ڕوونی دەخاتە ژوورەکەم› ☰ ١. آشکاری ٢. تَری ٣. روشنی

**ڕونیا** / řûnya/: ئاوەڵناو. ڕێ لەبەر گرتوو؛ لە حاڵی چووندا ☰ راهی

**ڕونیاس** / řûnyas/: ☜ **ڕۆنیاس**

**ڕونیاسە** / řûnyase/: ☜ **ڕۆنیاس**

**ڕونین** / řûnîn/: چاوگ. ڕۆنیشتن؛ دانیشتن ☰ نشستن

**ڕووە**[1] / řûwe/: ناو. ١. لەنگێزە؛ بارانی توند بە باوە ٢. ڕوو؛ بەشی دەرەوەی هەر شتێک ☰ ١. باد و باران شدید ٢. رویە

**ڕووە ـ**[2]: پێشوشە. بەرەـــ ؛ ڕووبەر ‹ڕووەفەرش؛ ڕووەدۆشەک› ☰ رو-

**ڕووەد** / řûwed/: ☜ **ڕو**[1]**ـ٢**

**ڕووەو** / řûwew/: ئامراز. بەرەو ؛ وەلای ‹ڕووەو بان؛ ڕووەو خوار› ☰ بە سوی

**ڕووەوبەرەوژوور** / řûweberewjûr/: ناو. پێهەڵ؛ پێهەلا؛ سەربەرەوژوور ☰ سربالایی

**ڕووەونشێو** / řûwewn(i)şêw/: ئاوەڵناو. بەرەولێژ ☰ شیبدار

**ڕووهەڵمالاو** / řûhełmaław/: ☜ **ڕوداماڵراو**

**ڕوهەڵماڵدراو / ř̂uhełmałd(i)raw/**: ☜ **ڕوداماڵراو**

**ڕوهەڵماڵراو / ř̂uhełmałraw/**: ☜ **ڕوداماڵراو**

**ڕوهیشک / ř̂ûhîşk/**: ناوەلناو. *[مەجاز]* ڕووگرژ؛ ناوچاوتاڵ ☰ اخمو

**ڕوی / ř̂ûy/**: ناو. بەرگەدە ☰ زهار

**ڕویال / ř̂ûyal/**: ☜ **ڕوتەن**

**ڕوبار / ř̂ûybar/**: ☜ **ڕوبار**

**ڕویت / ř̂ûyt/**: ☜ **ڕوت**

⊡ **ڕویت کردن**: ☜ **ڕوت کردن**

**ڕویتان / ř̂ûytan/**: ☜ **ڕوتەن**

**ڕویتانە / ř̂ûytane/**: ☜ **ڕوتەن**

**ڕویچ / ř̂ûyç/**: ☜ **ڕوت[1]ـ١**

**ڕویچاندن / ř̂ûyçandin/**: چاوگ. ڕووت کردنەوە ☰ لُخت کردن

**ڕویس[1] / ř̂ûys/**: ناو. ڕووش؛ ڕووشە ☰ خراش

**ڕویس[2]**: ☜ **ڕوت[1]ـ١**

**ڕویش / ř̂ûyş/**: ☜ **ڕوش**

**ڕویشاندن / ř̂ûyşandin/**: ☜ **ڕوشاندن**

**ڕویشای / ř̂ûyşay/**: ☜ **ڕوشاو**

**ڕویڤک / ř̂ûyvik/**: ☜ **ڕیخۆڵەـ١**

**ڕویل / ř̂ûyl/**: ☜ **ڕول**

**ڕوین[1] / ř̂ûyn/**: چاوگ. ڕۆین؛ ڕۆیشتن ☰ رفتن

**ڕوین[2]**: ☜ **ڕۆن**

**ڕوینیشتن / ř̂ûynîştin/**: ☜ **ڕۆنیشتن**

**ڕە[1] / ře/**: ناو. ڕەگ ☰ رگ

**ڕە[2]**: ئامراز. لە ‹ڕە پالی نیّ!؛ ڕە پیّ نان› ☰ در

**ڕەئیس / ře'îs/**: ناو. سەرۆک ☰ رییس

**ڕەئیسی / ře'îsî/**: ناو. سەرۆکایەتی؛ سەرۆکی ☰ ریاست

**ڕەب / řeb/**: ناو. بەرەی زین و کورتان ☰ از اجزاء زین و پالان

**ڕەبادان / řebadan/**: چاوگ. نقورچک گرتن ☰ نیشگون گرفتن

**ڕەباس / řebas/**: ناو. ئاودێری بۆ ڕەپستە ☰ آبیاری پیش از کشت زمین

**ڕەببی / řebbî/**: دۆعا. ڕەبی؛ یاخوا ‹ڕەبی ڕۆڵە بەختەوەر بی› ☰ الهی

**ڕەبت / řebt/**: ☜ **ڕەبیت**

**ڕەبساندن / řebsandin/**: چاوگ. ١. کردنە ڕەپستە ٢. کۆما کردن؛ تەپکە کردن ☰ ١. آب دادن قبل از کشت زمین ٢. کُپه کردن

**ڕەبسین / řebsîn/**: چاوگ. کۆما بوونەوە؛ قەلاپەچن بوون ☰ کُپه شدن

**ڕەبناک / řebnak/**: ☜ **ڕەبناوك**

**ڕەبناڵۆک / řebnałok/**: ☜ **ڕەبناوك**

**ڕەبناوک / řebnaw(i)k/**: ناو. سمڵ؛ ڕەبناڵۆک؛ ڕەبناک؛ سۆتکە ☰ مُشک زمین

**ڕەبە / řebe/**: ناو. ڕبە؛ عەیارێکە بۆ خەلە پێوان ‹بۆ لای هەرکەسێ کە پەنا ئەبەم/ داوای ڕەبەیەک گالی لیّ ئەکەم «قانع»› ☰ از پیمانەهای سنتی کشاورزی

**ڕەبەت / řebet/**: ناو. ڕەوەت؛ سیپە؛ بۆسە ☰ کمینگاه شکارچی

**ڕەبەش / řebeş/**: ناو. ڕەشبەشە؛ گامارۆ؛ کوڕەبەشە؛ مریشکەڕەشە؛ پەلەوەرێکی ئاوژی ڕەشە ☰ چلنگر

**ڕەبەق / řebeq/**: ناوەلناو. بیّزیاد و کەم؛ تەواو؛ بە تەواوی ‹ڕۆژی ڕەشە کە دێن و دەچن یەک بە شوێن یەکا/ چەرخی زەمان لە گەڕ دەبێ چل سالی دی ڕەبەق «شەریف»› ☰ آزگار

**ڕەبەن / řeben/**: ناوەلناو. ١. سەلت؛ بیّهاوسەر ‹ڕەبەن تامی ژیانیّ چۆن دەزانیّ/ ئەگەر «پیّ»شی بگاتە ئاسمانیّ «هێمن»› ٢. گەڕیدەی ماڵبەکۆڵ ‹ئێستە بۆ وا ڕەبەن و داماوم/ من هەلۆ چاولەدەمی قالاوم «سوارە»› ☰ ١. مُجرد ٢. خانەبەدوش

**ڕەبەنگ / řebeng/**: ناو. قالابن؛ ڕێواسی کولەبنە ☰

ریواس کوتاەقد

**ڕەبەنۆک / řebenok/**: ناو. گوڵەمێلاقە ☰ آلاله

**ڕەبەنی / řebenî/**: ناو. ١. سەڵتی؛ بێژن‌ومناڵی ‹ئەسڵەن ژن نەهێنم و بە ڕەبەنی بمێنمەوە «هێمن»› ٢. ماڵبەکۆڵی؛ گەریدەیی ‹وەک پریسکەی ڕەبەنی ئەو شار و ئەم دێ گەڕاو «سوارە»› ☰ ١. مُجردی ٢. خانەبەدوشی

**ڕەبی / řebî/**: دۆعا. ڕەببی؛ یا خودا ☰ الهی

**ڕەبیت / řebît/**: ئاوەڵناو. ڕەبت؛ زووڕەس؛ زووڕەسە؛ بە تایبەتمەندی زوو پێگەیین ☰ زودرس

**ڕەبیتن / řebîtin/**: چاوگ. پێگەیشتن ☰ رسیدن

**ڕەپ[1] / řep/**: ناو. خوونک؛ قاوانەی هەرکام لەو لاوانەی (بەتایبەت لە ولاتانی ڕۆژاوادا) کە بە جل‌وبەرگ و ئاڕایش و ئاکاری سەیر و سەمەرە، لە کۆمەڵگا و کۆگای گشتیدا خۆ دەردەخەن ☰ رَپ

**ڕەپ[2]**: ئاوەڵناو. ١. قیت؛ دەرپەڕیو؛ زۆپ ‹گوێی ڕەپ› ٢. ڕاست و ڕەوان؛ بێ‌وەشارتن ‹ئەمن ڕەپ و ڕاست، ئەتۆ پێچ و درۆزن› ٣. پەنەماوی توندبوو ☰ ١. برجستە؛ بارز ٢. رُک؛ صریح ٣. آماسیده

▣ **ڕەپ بوون**: ١. پڕی وا کە گنجی و شلی لێ ببڕێ ‹هێندەم پەنیر تێئاخنیوە، ڕەپ بووە› ٢. *[شوورەیی]* کێر هەستان ٣. *[کینایە]* درێژ بوون؛ مردن ☰ ١. پر شدن زیاد و با فشار ٢. برخاستن آلت مرد ٣. مُردن

**ڕەپ کردن**: قیت کردنەوە ☰ برجستە کردن

**ڕەپاڵ / řepal/**: ناو. جلکی شڕۆڵ ☰ لباس ژنده

**ڕەپاڵ[1] / řepał/**: ناو. شتی لە کار کەوتووی ئەیاغ ☰ کالای فرسوده

**ڕەپاڵ[2]**: ↓

▣ **ڕەپاڵ دان**: ١. پێوە خستن؛ ڕەگەڵ خستن ‹شتی سووکیان ڕەپاڵ داوە› ٢. ڕەپاڵ نان؛ دەرکردنی بە زۆری و بە سووکایەتی ‹ئێستا کەوتووە وەک سیپاڵ/ لە گشت لا دەیدەن ڕەپاڵ «هێمن»› ☰ ١. نسبت دادن ٢. دک کردن

**ڕەپاڵ نان**: ☰ ☜ **ڕەپاڵ دان ـ٢**

**ڕەپاندن / řepandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //ڕەپاندت؛ دەڕەپێنی؛ بڕەپێنە// ڕەپانن: ١. کوتانی شتی نەرم بە دەست یان بە دار ٢. بە لەپی دەست لە شتێ دان ‹خۆ تۆ قورئانت ڕەپاند چیتر کاری وا نەکەی!› ٣. ڕەتاندن؛ غار پێ‌کردن و ماندوو کردن ٤. بە تاو غاراندن؛ چوارناڵە پێ کردن ☰ ١. کوبیدن جسم نرم با دست یا چُماق ٢. کف دست بر چیزی زدن ٣. دواندن و خسته کردن ۴. تاختن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەڕەپاندن

**ڕەپانن / řepanin/**: ☜ **ڕەپاندن**

**ڕەپاوڕوو / řepawřû/**: ☜ **ڕووبەڕوو**

**ڕەپاوڕەپ / řepawřep/**: ئاوەڵکار. ڕەپ‌وڕاست؛ ڕاست‌وڕەوان؛ بێ‌ڕوودەروایسی ☰ رُک و راست

**ڕەپ ـ ڕەپ[1] / řep řep/**: ناو. کاری خۆ قیت کردنەوە و خۆ نواندن ‹بە کەر ناوێرێ، بە کورتان ڕەپ ـ ڕەپیەتی!› ☰ خودنمایی

**ڕەپ ـ ڕەپ[2]**: دەنگەناو. تەپەتەپ ‹تەپ ـ تەپ و ڕەپ ـ ڕەپ نانەکەت ئەکەی/ بە دەست و بە دەم نوێژەکەت ئەکەی/ بە چاو تەماشای دۆستەکەت ئەکەی! «فولکلۆر»› ☰ تاپ ـتاپ

**ڕەپڕەپان / řepřepan/**: دەنگەناو. ١. دەنگی پای سەماکەران ٢. دەنگی سم و سمکۆڵی سواران ☰ ١. صدای پایکوبی ٢. صدای سُم اسبان

**ڕەپڕەپە / řepřepe/**: ئاوەڵناو. بڵند و ڕاست (بەژن و باڵا) ☰ راست و بلند (قد و بالا)

**ڕەپڕەپیسک / řepřepîsik/**: ☜ **ڕەفیسك**

**ڕەپستە / řepiste/**: ناو. ڕبازە؛ ئاوەنیا؛ کۆڵەوەس؛ زەوی و زارێ کە ئاو دراوە و شۆ کراوە و تووی لێ چێندراوە و ڕوان و بەر دانی لێ بەدی دەکرێ ☰ آبسته؛ بسارده

**ڕەپسین / řepsîn/**: چاوگ. بزڕکان ☫ بریدن لبنیات

**ڕەپگە / řepge/**: ناو. گەنم و جۆی لە خیزەڵان چێندراوی کورتەباڵا کە زوو پێدەگا و بەرهەمی کەمە ☫ گندم و جو کاشته شده در زمین شنزار

**ڕەپن / řepin/**: ناو. ١. ڕووکار؛ ئەو بەشە لە هەر شتێ کە بەرچاوە ٢. زللە؛ شەپاڵە؛ زەرپی لەپی دەست ☫ ١. روکار ٢. سیلی

**ڕەپوڕاست / řep û řast/**: ناوەلکار. ڕپوڕاست؛ ڕەپاوڕەپ؛ بێ‌ڕووبینی؛ بە ڕاشکاوی؛ بێ‌ڕوودەروایسی ☫ رُک و راست

**ڕەپوڕەوان / řep û řewan/**: ناوەلناو. سفت‌وسادە؛ ڕاشکاوانە ☫ رُک و صریح

**ڕەپوەستاو / řepwestaw/**: ناوەلناو. گـژ ☫ سیخ شده (مو)

**ڕەپە / řepe/**: دەنگەناو. دەنگی ڕەپاندن؛ دەنگی کوتانی شتی نەرم ☫ تالاپ

**ڕەپەڕەپ / řepeřep/**: دەنگەناو. دەنگی ڕەپاندنی زۆر ☫ تالاپ تلوپ

**ڕەپەکە / řepeke/**: ناو. شیناوەردی بێ‌هێز و لاواز ☫ گیاه و سبزەی پلاسیده

**ڕەپەڵ / řepeł/**: ناو. ١. دەستەی کایەکەر؛ دەستەی هاوبازی ٢. لەوەڕ؛ پووش و پاری ئازاد ☫ ١. تیم بازی ٢. گیاه خشک بی‌صاحب

**ڕەپەڵگا / řepełga/**: ناو. ڕەپێڵگە: ١. لەوەڕگا؛ جێ‌لەوەڕی ئازاد ٢. یاریگە و جێگەی هاتن و چوون ٣. [کینایە] شوێنی فەرمان دان و دەسەڵاتی نابەجێ کەسێ ‹ماڵیان بۆتە ڕەپەڵگای شێخ!› ☫ ١. چراگاه آزاد ٢. میدان بازی ٣. محل تُرکتازی کسی

**ڕەپەلە / řepele/**: ناو. دەستەی گەمەکەران ☫ تیم بازی

**ڕەپی / řepî/**: ناو. زی؛ دەرپەڕیوی ☫ برجستگی

**ڕەپیتە / řepîte/**: ناوەلناو. دابەستە؛ پەروار ☫ پروار

**ڕەپیسک / řepîsk/**: ☜ **ڕەفیسک**

**ڕەپێ / řepê/**: ↓

⊡ **ڕەپێ بوون**: هەستانە سەر پێ ☫ بە پا خواستن

**ڕەپێ دان**: ڕەواندن؛ ڕەماندن؛ تاراندن ‹دەڵێم مافی خۆمم بدەنێ/ ڕەپێم دەنێ بۆ بەندەنێ «هێمن»› ☫ تاراندن

**ڕەپێتە / řepête/**: ناوەلناو. دابەستە؛ دابەستە؛ دابەسیاگ؛ هەملک؛ پەروار؛ بەن؛ چاخ و گۆشتن لە بەر خزمەت و خۆراکی باش ☫ پروار

**ڕەپێچکە / řepêçke/**: ☜ **ڕەپێچەك**

**ڕەپێچەک / řepêçek/**: ناو. ڕاپێچەک؛ ڕەپێچکە؛ ڕاماڵ ☫ رُفت‌وروب

⊡ **ڕەپێچەک دان**: ڕاپێچەک دان؛ ڕاماڵ دان ‹پۆلیس دەگەڵ چوار- پێنج کەس ڕەپێچەکیان داین و گەیاندینیانە وادی حەریر و تەسلیمی نوختەی سنووری سووریا کراین «هەژار، چێشتی مجێور»› ☫ با شتاب راندن و بُردن

**ڕەپێڵگە / řepêłge/**: ناو. ڕەپێڵە؛ کوێرەڕێ؛ ڕێگەی تەسک و بەپێچ‌وپلووچ کە بەهۆی هاتوچۆی خەڵک و چوارپێیان بەدی هاتووە ☫ کوره‌راه

**ڕەپێلە / řepêle/**: ☜ **ڕەپێلگە**

**ڕەت¹ / řet/**: ناو. ١. بزووتنی بە تەکان ‹کەروێشکەکە دە ڕەت کەوت› ٢. مردە و زیندە؛ قووڵکەی لە سەر ڕێگەی نێچیر ٣. هزر و بیر ‹لە ڕەتدام کە چی بکەم› ٤. قۆرت؛ ڕەتەڵ؛ دۆخی هەڵەنگووتن؛ پا هەڵکەوتن ٥. ڕەد؛ شوێن؛ شۆنەڕا ☫ ١. تکان ٢. چالەی راه نخجیر ٣. فکر و اندیشە ۴. سکندری ۵. رد؛ اثر

⊡ **ڕەت بردن**: ١. لەپڕ تەکان خواردن ٢. هەڵەنگووتن ‹پاڵی پێوە نام ڕەتم برد› ☫ ١. ناگهانی تکان خوردن ٢. سکندری خوردن

**ڕەت بوون**: ڕابردن ‹سەدەی سێزدەم بوو کاتێ هۆلاکۆ/ بە کوردستاندا وەک پەتا ڕەت بوو

«پەشێو» 🇮🇷 گذشتن

**ڕەت دان:** هەڵەنگووتن 🇮🇷 سکندری خوردن

**ڕەت کردن:** بەڕێ کردن و لە خۆ دوور خستنەوە 🇮🇷 رد کردن و از خود دور ساختن

**ڕەت لێ شێوان:** /مەجاز/ تێکچوون؛ زەین و بیر شێوان و لە سەر خۆ نەمان 🇮🇷 قات زدن

**ڕەت نەبردنە سەر کاری خۆ:** سەر لێ شێوان و شیرازەی کار لە دەست دەرچوون 🇮🇷 رشتەی کار را از دست دادن

**نیانە ڕەتەوە:** کەوتنە سەر؛ ڕە دوو کەوتن ‹کەرویشکێکم دی نیامە ڕەتییەوە نەمگرت› 🇮🇷 دنبال کردن

**ڕەت[2]:** ئاوەڵناو. کلا؛ لەڕێلادەر ‹ڕێگەکەی باش نەدەزانی، ڕەت بوو› 🇮🇷 منحرف از راه

**ڕەتان / řetan/:** چاوگ. تێنەپەڕ. //ڕەتای؛ دەڕەتیی؛ بڕەتێ// ڕەتین؛ ڕەتیان؛ هەلاتن؛ ڕاکردن لە ترسان 🇮🇷 گریختن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ڕەتاو/ چاوگی نەرێنی: نەڕەتان

**ڕەتاندن / řetandin/:** چاوگ. تێپەڕ. //ڕەتاندت؛ دەڕەتێنی؛ بڕەتێنە// ڕەتانن: ١. غار پێ کردن ‹بیستوحەوت ساڵە من ئەڕەتێنی/ بە فروفیشاڵ ئەمخەڵەتێنی «بێکەس»› ٢. تەواو ماندوو کردن ٣. /کینایە/ زۆر کار لێ کێشانەوە ‹کابرا قاچاخچییە ماشینەکەی ڕەتاندووە› 🇮🇷 ١. دواندن؛ گریزاندن ٢. از نا و نفس انداختن ٣. کار زیادی کشیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەڕەتاندن

**ڕەتانن / řetanin/:** ☜ **ڕەتاندن**

**ڕەتاو / řetaw/:** ئاوەڵناو. ڕەتیاگ: ١. زۆر غاردراو ٢. یەکجار ماندوو 🇮🇷 ١. دوانده شده ٢. از نفس افتاده

**ڕەتبردوو / řetbirdû/:** ئاوەڵناو. تلاو؛ تلبردوو 🇮🇷 غلتیده

**ڕەتبردە / řetbirde/:** ئاوەڵناو. سەرەنگرێ؛ هەڵەنگووتە 🇮🇷 سکندری خوردە

**ڕەتبەر / řetber/:** ئاوەڵناو. گلۆک 🇮🇷 سکندری‌خور

**ڕەتڕەتان / řetretan/:** ناو. کارو ڕەوتی نانەڕەتەوە و دەرچوون 🇮🇷 تعقیب و گُریز

**ڕەتماندن / řetmandin/:** چاوگ. ئاخنینەوەی زاری شتان 🇮🇷 درپوش گذاشتن

**ڕەتنای / řetnay/:** چاوگ. ڕەتاندن 🇮🇷 دواندن

**ڕەتە / řete/:** ناو. ڕەوت؛ چۆنیەتی ڕۆیشتن 🇮🇷 رفتار

**ڕەتەڵ / řeteł/:** ☜ **ڕەت[1]ـ٤**

⊡ **ڕەتەڵ بردن:** ڕەتەڵ دان؛ هەڵەنگووتن؛ هەڵکەوتن 🇮🇷 سکندری خوردن

**ڕەتەڵ دان:** ☜ **ڕەتەڵ بردن**

**ڕەتەنی / řetenî/:** ئاوەڵناو. لە سەر ڕۆیشتن 🇮🇷 رفتنی

**ڕەتەوە / řetewe/:** ناو. ١. تۆرەمەنامە؛ ڕەگەزنامە؛ شەجەرەی باب و باپیران ٢. ڕەگەز؛ تۆرەمە 🇮🇷 ١. شجرەنامە ٢. نژاد

**ڕەتەوی / řetewî/:** ناو. بەرخی لە شیر کراوەوە 🇮🇷 برّەی از شیر بُریده

**ڕەتیاگ / řetyag/:** ☜ **ڕەتاو**

**ڕەتیان / řetyan/:** ☜ **ڕەتان**

**ڕەتیای / řetyay/:** چاوگ. ڕەتان 🇮🇷 دویدن

**ڕەتیم / řetîm/:** ناو. چاڵی پڕکراو 🇮🇷 چالەی پُر شده

**ڕەتیماندن / řetîmandin/:** چاوگ. پڕ کردنەوەی چاڵ 🇮🇷 پُر کردن چالە

**ڕەتین / řetîn/:** ☜ **ڕەتان**

**ڕەتێن / řetên/:** ☜ **ڕەتێنەر**

**ڕەتێنراو / řetênraw/:** ئاوەڵناو. ترافیە؛ دەرکراو و دوورکراو 🇮🇷 رانده شده؛ طردشده

**ڕەتێنەر / řetêner/:** ئاوەڵناو. ڕەتێن؛ غارپێدەر؛ ئەوەی دەبێتە هۆی غار دانی گیاندار یان شتێک

▣ دوانندە

**ڕەج / řec/:** ☜ **ڕەگە ـ١**

**ڕەجا / řeca/:** ناو. مەهەدەر؛ هێڤی؛ هێوی ▣ شفاعت؛ رجا

**ڕەجاکەر / řecaker/:** ناوەڵناو. مەهدەرچی؛ تکاکار ▣ شفیع

**ڕەجاڵ / řecał/:** ناوەڵناو. بۆرەپیاگی نەدار ‹کوک و پۆشتە بم، رووت و ڕەجاڵ بم/ کۆشکم دە قات بێ، ویرانەماڵ بم ... «هەژار، *بۆ کوردستان*» › ▣ ناشناس فقیر

**ڕەجاڵە / řecałe/:** ناوەڵناو. عەلۆجەلۆ؛ ئەلۆجەلۆ؛ لاپۆتی ▣ رجّالە

**ڕەجفین / řecfîn/:** چاوگ. لەرزین ▣ لرزیدن

**ڕەجڵ / řec(i)ł/:** ناوەڵناو. شیاو؛ هێژا ▣ شایستە

**ڕەجم / řec(i)m/:** ناو. بەردباران؛ بەردەباران ▣ سنگسار

**ڕەجماندن / řecmandin/:** چاوگ. بەردەباران کردن ▣ سنگسار کردن

**ڕەجمین / řecmîn/:** چاوگ. بەردەباران بوون/ کران ▣ سنگسار شدن

**ڕەجوا / řecwa/:** ☜ **ڕجوا**

**ڕەجوان / řecwan/:** ناو. ئەسپی خۆشبەز ▣ اسب رهوار

**ڕەجەب / řeceb/:** ناو. ڕەجەولا؛ حەوتەمین مانگ لە ساڵی کۆچی ـ مانگیدا ▣ رجب

**ڕەجەز / řecez/:** ناو. ١. کێشێکی شیعری عەرووزی ٢. ئەرجووزە؛ گۆشەیەک لە دەزگای چوارگا لە مووسیقای ئێرانی ▣ ١و٢. رَجَز

**ڕەجەن / řecen/:** ناوەڵناو. ڕووت و ڕەجاڵ ▣ بینوا؛ بیچارە

**ڕەجەوڵا / řecewła/:** ☜ **ڕەجەب**

**ڕەچ / řeç/:** ☜ **ڕچ**

**ڕەچاو / řeçaw/:** ناو. ڕاچاو؛ بەرچاو؛ پێش‌چاو ▣ نظر

▣ **ڕەچاو کردن:** ڕاچاو کردن؛ هەڵبژاردن و دە بەر چاو گرتنی کەس یان شتێ بۆ کارێک ‹پێویستە لە هەموو بوارەکاندا، قانوون ڕەچاو بکەین!› ▣ در نظر گرفتن

**ڕەچسە / řeçse/:** ☜ **ڕچاو**

**ڕەچڵەخۆر / řeçłexor/:** ناو. ترترە؛ کرمی ڕیشەخۆر ▣ کرم ریشەخوار

**ڕەچوو / řeçû/:** ناو. لاساری؛ گوێنەبیسی ▣ لجاجت

**ڕەچووکار / řeçûkar/:** ناوەڵناو. لاسار؛ گوێنەبیس ▣ لجوج

**ڕەچەڵ / řeçeł/:** ☜ **ڕیچار ـ٢**

**ڕەچەلاک / řeçełak/:** ☜ **ڕەچەڵەك**

**ڕەچەڵەک / řeçełek/:** ناو. ڕەچەلاک؛ بنچینە؛ ڕەگ و ڕیشە ▣ نژاد

**ڕەچەڵەکناس / řeçełeknas/:** ناو. تۆرەمەناس؛ پسپۆڕ لە بنەما ناسیندا ▣ نژادشناس

**ڕەچەڵەکی / řeçełekî/:** ناوەڵناو. قەومی؛ گەلی ▣ ملّی

**ڕەح / řeĥ/:** ☜ **ڕۆح**

**ڕەحاتی / řeĥatî/:** ناو. ڕەحەتی؛ ڕاحەتی؛ ئامرازێکی زارگوشادی بن‌تەنگە شتی تراوی پێ لە دەفر دەکەن ▣ قیف

**ڕەحتی / řeĥtî/:** ناو. کاری وەستان لە بەر ماندوویی ▣ توقف به دلیل خستگی

**ڕەحم / řeĥm/:** ناو. ڕوحم؛ بەزەیی ▣ رحم

▣ **ڕەحم پێداهاتن:** بەزەیی پێدا هاتنەوە ‹ئەهلی ڕەحم و فەزلی تۆ، مەحوی دەخیل!/ سەد کەوا نائەهلە، ڕەحمت بێ پیا «مەحوی»› ▣ دل به رحم آمدن

**ڕەحم پێ کردن:** دلۆڤانی/ دلنەرمی کردن ▣ رحم کردن

**ڕەحم تلیسانەوە:** *[پلار]* ڕەحم خووسان/ خووسیان؛ بزووتنی ڕواڵەتی ڕەحم و بەزەیی و دەربڕینی ☰ ظاهراً دل به رحم آمدن

**ڕەحم خوسان/ خوسیان:** ☜ **ڕەحم تلیسیانەوە**

**ڕەحم خوساندن:** ☜ **ڕەحم نانە ئاو**

**ڕەحم سارد بونەوە:** بێمەیل بوون ☰ کم شدن میل و محبت

**ڕەحم کردن:** ١. بەزەیی نواندن ٢. بەخشین؛ چاوپۆشین ☰ ١. اظهار مهربانی و محبت کردن ٢. گذشت کردن

**ڕەحم نانە ئاو:** ڕەحم خووساندن؛ میهرەبانی کردن و خۆشەویستی نواندن پاش ماوەیەک ساردوسڕی ☰ اظهار محبت کردن پس از مدتی سردی

**ڕەحمەت / řeĥmet/:** ناو. ١. بەزەیی؛ خۆشەویستی ٢. کار و ڕەوتی بەخشین و لێخۆش بوون ‹پای هەوەس تەزان ئارەزوو مۆڵەق/ ماندەن وە ڕەحمەت بێپایان حەق «مەولەوی»› ☰ ١. مهربانی ٢. بخشایش

▣ **ڕەحمەت کردن:** داوا کردن لە خودا بۆ بەخشینی کەسێک ‹خودا ڕەحمەتی کا، پیاوی چاک بوو› ☰ رحمت فرستادن

**ڕەحمەت (بۆ) ناردن:** داوای بەخشین و دڵنەوایی لە خوا کردن دەرحەق کەسێ ☰ درود و رحمت فرستادن

**بە ڕەحمەت بون:** ١. بەر بەزەیی و لێبووردنی خوا کەوتن ٢. *[کینایە]* مردن؛ لە دنیا چوون ☰ ١. مشمول رحمت خدا شدن ٢. مُردن

**بە ڕەحمەت چون:** *[کینایە]* لە دنیا چوون ☰ مردن

**ڕەحمەتی / řeĥmetî/:** ئاوەڵناو. خواڵێخۆشبوو (بۆ مردوان) ☰ روانشاد

**ڕەحمین / řeĥmîn/:** ئاوەڵناو. بەڕەحم؛ دڵنەرم؛ خاوەن بەزەیی ☰ مهربان

**ڕەحەت[1] / řeĥet/:** ☜ **ڕەحەتەلقوم**

**ڕەحەت[2]:** ئاوەڵناو. ڕاحەت: ١. ئاسوودە ‹ژیانی ڕەحەت› ٢. ئاسان ‹کاری ڕەحەت› ☰ ١. راحت ٢. آسان؛ ساده

**ڕەحەت[3]:** ئاوەڵکار. ڕاحەت؛ بە ئاسانی؛ بە سانایی ‹ڕەحەت چووم و ڕەحەتیش هاتمەوە› ☰ راحت

▣ **ڕەحەت بون:** ١. حەسانەوە؛ ئاسوودە بوون ‹هەر ئەم زوبانە باعیسە بۆ سەربڕینی شەمع/ مەحوی! سەرم ڕەحەت بووە، بێلێ ئەگەر زوبان! «مەحوی»› ٢. *[کینایە؛ شەرمەرەیی]* ئاو هاتنەوە (پیاو)؛ زاوێر بوون (ژن)؛ دامرکانی هۆکی جینسی ژن یا پیاو ☰ ١. آسوده شدن ٢. ارضا شدن

**ڕەحەتەلقوم / řeĥetelqum/:** ناو. ڕەحەت؛ ڕەحەتی؛ شیرینییەکی نەرم و ڕەنگاوڕەنگە بە شەکر و نیشاستە دروستی دەکەن ☰ راحت‌الحلقوم

**ڕەحەتی / řeĥetî/:** ناو. ١. ☜ **ڕەحاتی** ٢. بێخەمی؛ ئاسوودەیی ٣. ☜ **ڕەحەتەلقوم** ☰ ١. ☜ **ڕەحاتی** ٢. آسودگی ٣. ☜ **ڕەحەتەلقوم**

**ڕەحێف / řeĥêf/:** ناو. لێف؛ لێفە؛ لێفک ☰ لحاف

**ڕەخ / řex/:** ناو. ١. ڕۆخ؛ قەراخ ‹ڕەخی چۆم› ٢. لا؛ لایەن؛ تەرەف ‹ڕەخی باشوور› ☰ ١. کنار ٢. طرف

**ڕەخت / řext/:** ناو. ١. زەنبەری سەری ئەسپ ٢. تەرح و دیدار ٣. فیشەکدان؛ فانوسقە ٤. بەرگ و شمەک ☰ ١. یراق اسب ٢. ریخت و قیافه ٣. فانوسقه ۴. رخت

**ڕەختخاو / řextxaw/:** ناو. پێخەف؛ نڤین؛ نوێن؛ دەستەنوێن ☰ رختخواب

**ڕەختە / řexte/:** ئاوەڵناو. خۆگرتە و قایم ☰ مُحکم و مُطمئن

**ڕەختەفیشەک / řextefîşek/:** ناو. فیشەکدان؛ فیشەکلۆخ ☰ تیردان

**ڕەخدار / řexdar/**: ناو. ڕێگەوان؛ ڕێوان؛ ئاگاداری ڕێگە و بان ☰ راهبان؛ راهدار

**ڕەخس / řexs/**: ناو. ١. هەڵپەڕکێ؛ داوەت ٢. هەبوو؛ هەسی ٣. دۆخی لوان؛ دەست دان ☰ ١. رقص ٢. وجود ٣. امکان

**ڕەخسان / řexsan/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //ڕەخسای؛ دەڕەخسێ؛ بڕەخسێ// ڕەخسین: ١. پێکهاتن؛ بەدیهاتن ‹دەرفەتێکی باشیان بۆ ڕەخساوە› ٢. گونجان؛ لوان؛ بووز خواردن ‹هەرگیز بۆمان نەڕەخسا دەرس بخوێنین› ٣. خەلسان؛ ڕزگار بوون ‹بە دوو هەزار حەب لە خەتەر ڕەخسام و ڕۆژ بە ڕۆژ لە چاکی بووم «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ ١. به وجود آمدن ٢. ممکن شدن ٣. نجات یافتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ڕەخساو/ چاوگی نەرێنی: نەڕەخسان

**ڕەخساندن / řexsandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //ڕەخساندت؛ دەڕەخسێنی؛ بڕەخسێنە// پێکهێنان؛ بەدیهێنان؛ ڕەخسنای ‹گەمییەکی نۆح بڕەخسێنە بۆم/ لە گێژ سەرکەوم نەکەومە بن گۆم «پیرەمێرد»› ☰ ممکن ساختن؛ فراهم آوردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: —/ چاوگی نەرێنی: نەڕەخساندن

**ڕەخساو / řexsaw/**: ئاوەڵناو. ڕەخسیو: ١. پەیدابوو ٢. خەلسیو؛ ڕزگاربوو ☰ ١. میسر شده ٢. نجات یافته

**ڕەخسنای / řexsnay/**: ☜ **ڕەخساندن**

**ڕەخسین / řexsîn/**: ☜ **ڕەخسان**

**ڕەخسیو / řexsîw/**: ☜ **ڕەخساو**

**ڕەخش / řexş/**: ناو. ڕەختی ئەسپ ☰ یراق اسب

**ڕەخشان / řexşan/**: ئاوەڵناو. تیشکدەر؛ بریقەدەر ☰ رخشنده

**ڕەخنە / řexne/**: ناو. ڕەغنە: ١. شلی و سستی ٢. قەڵش؛ درز ☰ ١. سُستی ٢. درز؛ شکاف

**ڕەخنەگر / řexnegir/**: ناو. ڕەغنەگر؛ کونگر ☰ درزگیر

**ڕەخوڕۆخ / řex û řox/**: ☜ **ڕاخوڕەخ**

**ڕەخیزە / řexîze/**: ناو. گیایەکە وەکوو گوێنی، بنجی هەیە بەڵام دڕووی نییە ☰ گیاهی است

**ڕەد[1] / řed/**: ناو. ١. کاری دانەوە؛ دانەدواوە؛ گەڕاندنەوە؛ وەرنەگرتن ٢. کاری لە خۆ دوور خستنەوە ☰ ١و٢. رد

⊡ **ڕەد بوون**: ڕەد بین؛ ڕابردن ☰ گذر کردن؛ گذشتن

**ڕەد بین**: ☜ **ڕەد بوون**

**ڕەد کردن**: ١. وەرنەگرتن؛ ڕەد کردنەوە ٢. ڕەت کردن؛ لە خۆ دوور خستنەوە ٣. تێپەڕاندن؛ تێپەڕ کردن ‹بێزەحمەت ئەو منالە لەو جۆگەوە ڕەد کە› ☰ ١. رد کردن ٢. از خود دور ساختن ٣. عبور دادن

**ڕەد[2]**: ئاوەڵناو. ڕفووزە؛ لە ئەزموون دەرنەچووگ ☰ مردود

**ڕەدا / ředa/**: ناو. دۆخی قایل بوون؛ ڕەزا بوون ☰ راضی بودن

⊡ **نەهاتنە ڕەدا**: ڕازی نەبوون؛ مل نەدان ‹هەرچەند کردم و کڕاندم بۆم نەهاتە ڕەدایە› ☰ راضی نشدن

**ڕەداڵە / ředałe/**: ناو. ڕداڵ ☰ پیر هوسباز

**ڕەداندن / ředandin/**: چاوگ. لە خۆ دوور کردنەوە ☰ راندن؛ از خود دور کردن

**ڕەددووکەوتە / ředdûkewte/**: ☜ **ڕەدوکەوتو**

**ڕەدم / ředm/**: ناو. ڕەوتی پڕ بوونەوەی چاڵایی ☰ فرایند پُر شدن

**ڕەدماندن / ředmandin/**: چاوگ. پڕ کردنەوەی چاڵایی ☰ پُر کردن چاله

**ڕەدوو / ředû/**: ☜ **ڕادو**

⊡ **ڕەدوو خستن**: وە شوێن خستنی ژن کە دەگەڵ

پیاوێ ڕاکات ☚ فراری دادن زن با مرد

**ڕەدو کەوتن:** هەڵاتنی ژن دەگەڵ پیاوی دڵخوازی ☚ فرار کردن زن با مرد دلخواهش

**ڕەدو نان:** ڕادوو نان؛ کەوتنە شوێن گیانداریک بە غار ☚ به دنبال حیوانی دویدن

**ڕەدوکەوتوو** / ředûkewtû/: ☜ **ڕەددووکەوتە**

**ڕەدوکەوتە** / ředûkewte/: ناو. ڕەدووکەوتوو؛ ڕەددووکەوتە؛ ژنی هەڵاتوو دەگەڵ پیاوی دڵخوازی ☚ زن فراری با مرد دلخواهش

**ڕەدە** / řede/: ناو. ١. ڕەوەز؛ جێگەی سەخت و بەرداوی لە چیادا ٢. *[ژیناسی]* لە یەکەگەلی ڕزن کردنی گیانەوەر و گیا، بریتی لە چەند ڕاستە، کە خۆی بەشێکە لە لقێک ☚ ١. جای سخت و سنگلاخ در کوه ٢. رده (زیستشناسی)

**ڕەدیمان** / ředîman/: چاوگ. ئاوەژوو کردنەوەی دەفر؛ نخوون کردنەوەی ئامان ☚ واژگون کردن ظرف

**ڕەز** / řez/: ناو. ١. باغی ترێ ٢. بنە ترێ ☚ ١. تاکستان ٢. تاک

**ڕەزا**[1] / řeza/: ناو. ١. تەرح و دیدار ٢. ڕەزامەندی ‹من ڕەزام لە سەر کاری وا نییە› ☚ ١. سیما و قواره ٢. رضایت

⊡ **ڕەزای خوا لە کەسێک بوون:** *[دوعا]* خوا لە کەسێک ڕازی بوون ‹زۆر ژنێکی ئازا و دایکێکی میهرەبان بوو، ڕەزای خوای لێ بێ› ☚ خدا کسی را آمُرزیدن

**ڕەزا**[2]: ئاوەڵناو. ڕازی؛ قایل ☚ راضی

**ڕەزاتاڵ** / řezatał/: ☜ **ڕەزاگران**

**ڕەزاسوک** / řezasûk/: ☜ **ڕەزاشیرین**

**ڕەزاشیرن** / řezaşîrin/: ☜ **ڕەزاشیرین**

**ڕەزاشیرین** / řezaşîrîn/: ئاوەڵناو. ڕەزاسووک؛ ڕەزاشیرن؛ ئێسکسووک ☚ سبکروح

**ڕەزاقورس** / řezaqurs/: ☜ **ڕەزاگران**

**ڕەزاقی** / řezaqî/: ناو. جۆرێ ترێ ☚ نوعی انگور

**ڕەزاگران** / řezag(i)ran/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ڕەزاتاڵ؛ ڕەزاقورس؛ ئێسکقورس ☚ گرانجان

**ڕەزامەند** / řezamend/: ☜ **ڕازی ـ٢**

**ڕەزامەندی** / řezamendî/: ناو. ڕەزا؛ ڕەزایەت ☚ رضایت

**ڕەزانە** / řezane/: ناو. پیتاکی ڕەز؛ باجی باغی ترێ ☚ باج تاکستان

**ڕەزاو** / řezaw/: ناو. سەرەتای پێکگەیشتنی دوو چۆم ☚ مصب رودخانه

**ڕەزاوان** / řezawan/: ☜ **ڕەزەوان**

**ڕەزایەت** / řezayet/: ناو. ڕەوت یا دۆخی ڕازی بوون؛ پێ ڕازی بوون ☚ رضایت

**ڕەزایەتنامە** / řezayetname/: ناو. نامەیەک کە تێیدا ڕەزامەندی لە کار یان کردەوەی کەس، گرۆ یان ڕێکخراوەیەک دەربڕاوە ☚ رضایتنامه

**ڕەزبەر** / řezber/: ناو. ١. کەوچەرین؛ کەوچڕ؛ میوەگەنان؛ تووڵتەکن؛ ماڵەژێر؛ مانگی حەوتەم لە ساڵی ئێرانی، یەکەم مانگی پاییز کە ٣٠ ڕۆژە ‹ڕەزمان هاتە بەر، لە خەم بووین ڕزگار/ ڕەزبەر بە خێر بێی بۆ کوردی هەژار «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ٢. جەنگەی ترێ گەیشتن ☚ ١. مهرماه ٢. موسم انگور

**ڕەزڕەزۆک** / řezřezok/: ناو. ڕەزگی؛ ڕێزلە؛ ڕێزەڵە؛ ڕێزەڵەمارانە؛ ڕێزەڵەمارە؛ ڕەزلە؛ هەڵەزرە؛ هەڵەریزە؛ حەڵەزرە؛ هەڵەرزگە؛ ئاڵەرزگە؛ ترێڕێوی؛ ڕەسلێ رووڤی؛ هەڵاڵەوزەمزەم؛ تووڵەزەرە؛ تەماتە مرۆژە؛ شیرینوتاڵ؛ قەبقەبۆک؛ گیایێکی چەند ساڵەیە گوڵی سپی یان بەنەوش دەدا و میوەکەی زەردە ☚ تاجریزی

**ڕەزڤان** / řezvan/: ☜ **ڕەزەوان**

**ڕەزگی** / řezgî/: ☜ **ڕەزڕەزۆک**

**ڕەزڵخوا**[1] / řezilx(i)wa/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* ڕەزەڵخوا؛

ڕووت و نەداری تەواو ☰ بینوا

**ڕەزڵخوا[٢]**: ئاوەڵکار. ڕەزەڵخوا؛ لە ڕای خوا ☰ در راه خدا

**ڕەزڵـــە / řezłe/**: نــــاو. ١. ☜ **ڕەزڕەزۆک** ٢. مۆغەرەی پشـت ☰ ١. ☜ **ڕەزڕەزۆک** ٢. مُهرەی پُشت

**ڕەزڵەپێچ / řezłepêç/**: نـاو. گیایەکـە بـۆ دەرمـان دەشێ ☰ گیاه هوفاریقون

**ڕەزڵـەگاوانـە / řezłegawane/**: نـاو. مایەسـیرە ☰ مای‌مرز

**ڕەزنە / řezne/**: ☜ **ڕازیانە**

**ڕەزوان / řezwan/**: ☜ **ڕەزەوان**

**ڕەزوو / řezû/**: ناو. نەمامی دار بەڕوو ☰ نهال بلوط

**ڕەزەڵخوا / řezełx(i)wa/**: ☜ **ڕەزڵخوا**

**ڕەزەن / řezen/**: ناو. ڕزدە؛ ئاڵـقەڕێز و دوولایـی ☰ چفت در

**ڕەزەوان / řezewan/**: ناو. ڕەزڤان؛ ڕەزوان؛ ڕەزاوان؛ باخـەوانی بـاخی تـرێ ‹ڕەز بـۆ ڕەزەوان، پـەز بـۆ پەزەوان «مەسەل»› ☰ رزبان؛ باغبان رز

**ڕەزیانە / řezyane/**: ☜ **ڕازیانە**

**ڕەزیل / řezîl/**: ئاوەڵناو. ١. ڕژد؛ چکووس؛ چکـوود؛ دەس‌قووچاو ‹نە ڕەزیل و چـرووک بـە، نـە دەسـت بلاو. بابم دەیگوت: دەوڵەمەندی خەسیس و فەقیری سەخی دەبـێ هـەردووکیان بـۆ بابیـان عـاقڵ کـرێن «هەژار، چێشـتی مجێـور»› ٢. بـەزیو و تـەزیو لـە دریژەدانی ملە ٣. داماو؛ دەسەپاچە؛ بێ‌دەسەلات ‹ئەگـەر دوکتـور عـەزیزی فەیزنـەژاد لـە ئەڵـمانەوە یارمـەتی نـەدابام، لام وایـە ڕەزیـل دەبـووم «هـەژار، چێشتی مجێور»› ٤. چرووک؛ بێ‌بایەخ ‹پێکـەنی، گوتی: شیعریش، ئەو سنعاتە ڕەزیلـە خـاتر و مـاتری دەوێ؟! «هـەژار، چێشـتی مجێـور»›. هـەروەها: **ڕەزیلی** ☰ ١. خسیس ٢و ٣. زبون ۴. بی‌ارزش

**ڕەژ / řej/**: ناو. ١. ڕەش؛ سیا؛ بەرانبەری سـپی ٢. دەرمانی ڕەنگ کردنی موو ☰ ١. سیاه ٢. رنگِ مو

**ڕەژان / řejan/**: ☜ **ڕەژتن-١**

**ڕەژاندن / řejandin/**: چاوگ. ڕژاندن ☰ ریختن

**ڕەژتن / řejtin/**: چـاوگ. ڕەشـتن: ١. ڕەژان؛ مـوو ڕەنگ کردن ٢. چاو بـە کـل ڕشـتن ☰ ١. رنـگ کردن مو ٢. سُرمه کشیدن چشم

**ڕەژتنـەوە / řejt(i)newe/**: چاوگ. ١. ☜ **ڕشتنەوە** ٢. هەموو لا گرتنەوە ☰ ١. ☜ **ڕشتنەوە** ٢. فراگیر شدن

**ڕەژدە / řejde/**: ☜ **ڕەنگ[١]-١**

**ڕەژمیری / řejmîrî/**: ناو. جۆرێ ترێ ☰ نوعی انگور

**ڕەژنە / řejne/**: ☜ **ڕێژنە**

**ڕەژوو / řejû/**: ☜ **ڕەژی**

**ڕەژەکی / řejekî/**: ناو. کوێروو ☰ سیاهک گندم

**ڕەژەن / řejen/**: ناو. دوودە؛ قورمی بـن دیـزە و ... ☰ دوده

**ڕەژی / řejî/**: ناو. ڕەژوو؛ ڕێژوو؛ خەڵووز؛ سوخاڵ ☰ زُغال

**ڕەژیای / řejyay/**: چاوگ. ڕێژران ☰ رنگین شدن

**ڕەژیدان / řejîdan/**: ناو. خەڵووزدان؛ جـێ‌خەڵـووز ☰ زُغالدان

**ڕەژیدە / řejîde/**: ئاوەڵناو. ڕەشتوو ‹بە قەوس قەتران بـان دوو دیـدەوە/ پـەی گۆنـای گوڵـڕەنگ حـەق ڕەژیدەوە «ئەحمەدبـەگی کۆماسـی»› ☰ رنگـامیزی شده

**ڕەژیـدەر / řejîder/**: نـاو. ١. چێکـەر؛ ئافرێنــەر ٢. دروست‌کەرەوە ☰ ١. آفریننده ٢. تعمیرکار

• **ڕەس / řes-/**: پاشەوشە. پێ‌ڕاگەیێن ‹فریـاڕەس› ☰ - رس

**ڕەســا / řesa/**: ئاوەڵـناو. ١. پـــێ‌گەیشـــتوو؛ پێ‌ڕاگەیشتوو؛ پراوپڕ ٢. ڕەساوپەسا؛ بـە چەنـد و چۆنییەکی تەواو و دڵخوازەوە ‹دەنگی ڕەسا› ☰ ١. رسیده؛ کفایت‌کننده ٢. رسا

**ڕەســـاندن / řesandin/:** چـــاوگ. ١. لکانـــــدن؛ پێوەنووســـاندن ٢. گەیانـــدن ☰ ١. چســـباندن ٢. رساندن

**ڕەساوپەسا / řesawpesa/:** ☜ **ڕەسا ـ٢**

**ڕەسایی / resayî/:** ناو. بڕ؛ هەندی کارکۆیی ☰ بُرد

**ڕەستی / restî/:** ناو. مشکی؛ شەدە؛ جۆرێ پارچەی ئاوریشم کە دەکرێتە پێچی سەر ☰ نـوعی دستار ابریشمی

**ڕەسخ / řesx/:** ناو. بەردباران ☰ سنگسار

**ڕەسلێ رووڤی / řeslêrûvî/:** ☜ **ڕەزڕەزۆك**

**ڕەسم / řesm/:** ناو. ١. داب؛ ڕێوشوێن ‹بـە ڕەسـم عەرەب بەرگ ڕەش پۆشا/ یەکسال جە ئەغیار شادی نەنۆشـا «خانـای قوبـادی»› ٢. شـکڵ؛ بـیچم ٣. شێوەکاری؛ ئەوی بە دەست کێشراوە ☰ ١. عُـرف ٢. شکل ٣. نقاشی

◘ **ڕەسم کێشان:** ١. بە قەڵەم لە سەر کاغـەز شـت کێشان ٢. بە دووربین (کامێرا) لە کەسـێ یـان شتێ وێنە هەڵگرتنەوە ☰ ١. نقاشی کشـیدن ٢. عکس گرفتن

**ڕەسم گـرتن:** ڕەســم کێشــان؛ عـەکس گــرتن ‹ئاورێک بەرەو بە ڕووی نازەوە/ با ڕەسمت بگرم بە جلی تازەوە «فولکلۆر»› ☰ عکس گرفتن

**ڕەسمچی / řes(i)mçî/:** ☜ **نەققاش ـ١**

**ڕەسمکێش / řes(i)mkêş/:** ☜ **عەکاس**

**ڕەسـمی / řesmî/:** ئاوەڵـناو. فـەرمی: ١. سـازگار و هاوئاهەنگ لەگەڵ قانوونگەل و ڕێوزێی وەرگیراودا ‹بەرگ و پێڵاوی ڕەسمی› ٢. بـەپێی قـانوون یـان نەریتی جەماوەر ‹کۆبوونـەوەی ڕەسمـی› ☰ ١و٢. رسمی

**ڕەسنە / řesne/:** ناو. گوریس؛ گورێس ☰ رسن

**ڕەسـەت / řeset/:** نـاو. ڕەهــەڵ؛ ڕیســـە؛ بـاوانی؛ پێتەک؛ جیازی ☰ جهاز عروس

**ڕەسەن[1] / řesen/:** ناو. بنەچەکە؛ بنچینە ☰ نژاد

**ڕەسەن[2]:** ئاوەڵـناو. هـیلاو؛ گـران؛ ئـادەر؛ جسـن؛ بنـدڕس؛ جانـەدان؛ بـە نـژادی چـاک ‹ئەسـپی ڕەسەن› ☰ اصیل؛ نجیب

**ڕەسەو / řesew/:** ناو. جەز؛ جێز؛ مالووسکە گەنمی سوور بووی خەرمان ☰ گندم پاک شدەی خرمن

**• ڕەسی / řesî-/:** پاشەوشە. گەییشتن ‹فریاڕەسی› ☰ ـ رسی

**ڕەسید / řesîd/:** نـاو. دڤـانەک؛ نووسـراوەیێ کـە گــرتنی شــتێ لــە لایــەن نووســەرەکەیەوە دەسەلمێنێ ‹ئەگەر پارەکەت دا، ڕەسید وەرگـرە!› ☰ رسید

**ڕەسیدە / řesîde/:** ئاوەڵناو. تازەپێگەیشـتوو (مـرۆ) ‹منالەکە شوکور ڕەسیدە بووە› ☰ بُرنا

**ڕەسین / řesîn/:** چاوگ. گەیشتن ☰ رسیدن

**ڕەسیو / řesîw/:** ئاوەڵـناو. گەیشـتوو؛ گەیشـتی ☰ رسیده

**ڕەش[1] / řeş/:** نـاو. ڕەژ: ١. سـیاو؛ سـێیە؛ سـیە؛ ڕەنگی خەڵووز یان ئاسمانی شەوی تار ٢. *[مەجاز]* گنجـی ڕەش؛ بـەرگی تازیـەباری ‹هــەر ڕەش ئەپۆشێ› ٣. *[کینایە]* قـوون؛ قنـگ ‹دانـەی دەمـت نەماوە و لە گەف ناکەوی هێشتا/ پیرەکەری چەنـەباز ئەڵێم بکەم بە ڕەشـتا! «شـێخ ڕەزا»› ☰ ١. سـیاه ٢. رخت عزا ٣. مقعد

**ڕەش[2]:** ئاوەڵناو. ڕەژ؛ سیاو؛ سێیە؛ سـیە؛ سـییە: ١. سیاون؛ بە ڕەنگی ڕەش ‹کراسی ڕەش› ٢. *[مەجاز]* نالەبار ‹ڕۆژگاری ڕەش› ٣. تاریک ‹شـەوی ڕەش› ٤. *[مەجاز]* نـاخۆش؛ دزێـو ‹کارنامـەی ڕەش› ٥. *[کینایە]* ڕەشپێست؛ سیاپۆس ☰ ١تا٥ سیاه

◘ **ڕەش بوون:** *[کینایە]* لە بەر چـاو کـەوتن؛ کـەس نەویستن ☰ منفور شدن

**ڕەش بوونەوە:** ١. *[مەجاز]* بـەفر لـە سـەر زەوی لاچوون ٢. کوژانەوەی پۆلوو ٣. تۆخ بوونەوەی ڕەنگی پێست لە بەر تاو ☰ ١. آب شدن برف ٢.

زغال شدن اخگر ٣. بُرُنزه شدن

**ڕەش داگەڕان:** *[کینایە]* ڕەش داگەڕیان؛ ڕەش داگیرسان؛ ڕەش هەڵگەڕان؛ ئارەق کردن و گرژ بوون لە ڕکان ☰ سخت خشمگین شدن

**ڕەش داگەڕیان:** ☜ ڕەش داگەڕان

**ڕەش داگیرسان:** ☜ ڕەش داگەڕان

**ڕەش ڕاهاتن:** *[مەجاز]* لەپڕ ون بوون ‹هەر ئیستا کتێبەکەم دانا، نازانم کوێرا ڕەش ڕاهات› ☰ گم شدن ناگهانی

**ڕەش ڤەلین:** *[کینایە]* ڕەش هەڵگەڕان لە تەریقی ☰ سیاه شدن از شرمندگی

**ڕەش کردن:** ١. *[مەجاز]* لە بەر چاو خستن ٢. دە سماقدا زەرد کردنی گیا ☰ ١. از نظر مردم انداختن ٢. در سماق آبپز کردن

**ڕەش کردنەوە:** ١. *[کینایە]* نووسینی مەشق ٢. *[مەجاز]* گڵەبان کردنی بان ٣. تارمایی بەر چاو هاتن ٤. *[کینایە]* پاک کردنەوە؛ سڕینەوە ‹وێنەکە ڕەش بکەوە با نەمێنێ› ☰ ١. مشق نوشتن ٢. خاکریز کردن بام ٣. شبح پیش چشم آمدن ۴. حذف کردن

**ڕەش گرێ دان:** *[کینایە]* ئازیەتبار بوون ☰ سوگوار بودن

**ڕەش و شین بوونەوە:** بە هۆی نەگەیشتنی خوێن و هەوا بە ئەندامەکانی لەش، ڕەش بوونەوە ‹منداڵەکە هێندە گریا، ڕەش و شین بووەوە› ☰ سیانوزه شدن

**ڕەش هەڵگەڕان:** ☜ ڕەش داگەڕان

**ڕەش** [٣]: پێشوشە. ١. خاوەن ڕەنگی ڕەش ‹ڕەشبازگ؛ ڕەشاف› ٢. *[مەجاز]* بە دۆخی خراپ ‹ڕەشبگیر؛ ڕەشخوێن؛ ڕەشکوژ› ☰ ١. سیاه ٢. بد

**ـ ڕەش** [٤]: پاشەوشە. *[مەجاز]* ناڵەبار؛ خراپ ‹چارەڕەش› ☰ سیاه

**ڕەشئەسمەر / řeş'esmer/:** ناوەڵناو. سەوزە؛ سەوزەڕەنگ ☰ سبزه‌ی گندم رنگ

**ڕەشاتی / řeşatî/:** ناو. ١. ڕەشایەتی؛ ڕەشی ٢. تاریکایی شەو ☰ ١. سیاهی ٢. تاریکی شب

**ڕەشادۆک / řeşadok/:** ناو. تەڕەتیزە ☰ ترتیزک

**ڕەشاش / řeşaş/:** ناو. ڕێژنگ؛ شەستیر؛ شێستیر؛ ڕەشاشە؛ موسەلسەل؛ ئاگربار؛ تیربار؛ مەترەلۆز؛ مەترەلوێز؛ جۆرێ ئامرازی شەڕی گەرم کە فیشەک بە ڕیز دەهاوێ ☰ مُسلسل

**ڕەشاشە / řeşaşe/:** ☜ ڕەشاش

**ڕەشاڤ / řeşav/:** ناو. ڕەشاو: ١. ئەوسێ؛ چەشنێ نەخۆشی چاو، وێڕای ژان و کز بوونی چاو کە ئەگەر دەرمان نەکرێ، کوێری دێنێ ٢. کێم و زووخی دەروون ☰ ١. آبسیاه ٢. عفونت داخلی

**ڕەشالووک / řeşalûk/:** ناو. گولک؛ ڕیشوو ☰ منگوله

**ڕەشان / řeşan/:** ناو. *[مەجاز]* ڕەشانگ؛ سیاوان: ١. بزن ٢. گۆشتی بزن ☰ ١. بُز ٢. گوشت بُز

**ڕەشاندن / řeşandin/:** چاوگ. پرژاندن ☰ پاشیدن

**ڕەشانگ / řeşang/:** ناو. ڕەشکەن: ١. زەمینی بەفر لە سەر لاچوو ‹بەفرێ بێوەعدە ڕەشانگی بڕی/ ڕەشانگ و سپی پاکیان سەر بڕی «سەیفولقوزات»› ٢. ☜ ڕەشان ☰ ١. زمینی که برفش آب شده ٢. ☜ ڕەشان

**ڕەشانەوە / řeşanewe/:** چاوگ. ڤەڕشان؛ هەڵهاوردنەوە ☰ قی کردن؛ بالا آوردن

**ڕەشاو** [١] **/ řeşaw/:** ☜ ڕەشاڤ

**ڕەشاو** [٢]: ناوەڵناو. پرژاو ☰ پاشیده

**ڕەشایەتی / řeşayetî/:** ☜ ڕەشاتی ـ١

**ڕەشایی / řeşayî/:** ناو. ١. ڕەشی؛ ڕەشاتی ٢. تارمایی لە شەودا ٣. گوندنشینی بێجووت و گا ٤. زەوی کە بەفری لە سەر چۆتەوە ٥. وشکانی؛ وشکی ٦. تاریکایی ☰ ١. سیاهی ٢. شَبَح ٣. خوش‌نشین ۴. زمینی که برفش آب شده ۵. خشکی ۶. تاریکی

▣ **ڕەشایی داهاتن**: ١. بە نەخۆشـی ڕەشـاف، چـاو لێڵ بوون ٢. *[کنایە]* کوێر بوون ☰ ١. تـار شـدن چشم از آب‌سیاه ٢. نابینا شدن

**ڕەشباز / řeşbaz/**: ☜ **ڕەشبازگ**

**ڕەشبازگ / řeşbazig/**: ئاوەڵناو. ڕەشباز؛ ڕەشـبازوو؛ ڕەش‌وبازگ؛ بەڵەکی ڕەش و سپی ☰ ابلق

**ڕەشبازوو / řeşbazû/**: ☜ **ڕەشبازگ**

**ڕەشباڤ / řeşbav/**: ☜ **ڕەشباو**

**ڕەشبام / řeşbam/**: ☜ **ڕەشباو**

**ڕەشباو / řeşbaw/**: ئاوەڵـناو. ڕەشـباڤ؛ ڕەشـبام؛ ڕەشـبۆرە؛ سـیازەندۆق؛ تاڵـە؛ تێلـە؛ تێڵـە؛ ئاماڵ‌ڕەش؛ مەیلەوڕەش؛ کەوەی تۆخ ☰ سیەفام

**ڕەشبگیر / řeşb(i)gîr/**: نـاو. زۆربگـیر؛ سـەفەربەر؛ کاری بە زۆر گرتن و بۆ شەڕ نـاردنی بـە کۆمـەڵ ‹دەستیان کرد بە ڕەشـبگیر/ ناپـارێزن جـوان و پـیر «هێمن»› ☰ بسیج اجباری به جنگ

**ڕەشبۆرە / řeşbore/**: ☜ **ڕەشباو**

**ڕەشبۆز / řeşboz/**: ئاوەڵـناو. ئەسـپی ڕەشـی ئاماڵ‌شین ☰ اسب سیاه مایل به کبود

**ڕەش‌بەش / řeşbeş/**: نـاو. ڕەش‌بەشـە؛ کوڕەبەشـە؛ گامـارۆ؛ گامارولـە؛ گامارۆلـە؛ گامارۆڵـە؛ مریشکەڕەشە؛ مریشکی حەبەشە؛ باڵندەیەکە لـە تۆرەمەی مریشکاویلە، نزیـک ٣٧ سـانتی‌میتـرە، ڕەش و بەشە، لاقی شینە، قامکەکانی هەر یەکـە بە جیا پەردەیان هەیە، بە باڕی بۆرە و بەرسینگ و ملی مەیلـەو سپییە، زیـاتر لـە ئاودایـە، بینـە دەکێشێ، زسـتانان بـە گـەل دەژی، بـە دژواری هەڵدەفڕێ و دەبێ ماوەیەکی زۆر بە سـەر ئـاودا ڕابکا، لـە ئـاوی تفـت و شـیریندا دەژی، لـە نـاو قامیش و گیا و گۆلی قەراخ ئاو هێلانـە دەکـا ☰ چنگر

**ڕەش‌بەشە / řeşbeşe/**: ☜ **ڕەش‌بەش**

**ڕەشبەڵەک[1] / řeşbełek/**: ناو. ١. گەنم‌وجۆ؛ داوەتی ژن و پیاو لە دەستی یەکتردا ٢. نووسراوی سـەر قاقەز ٣. بەنە بادراوێکە ڕاسـت و چـەپ دە ملـی منالانی دەکەن ☰ ١. رقـص مـرد و زن بـا هـم ٢. نوشته ٣. نخی که به گردن بچه‌ها می‌آویزند

**ڕەشبەڵەک[2]**: ئاوەڵناو. بازگ؛ ڕەشباز ☰ ابلق

**ڕەشبین / řeşbîn/**: ئاوەڵـناو. *[مـەجاز]* ١. بـەدبین؛ چاوتاریک؛ خـاوەن لێکدانـەوە و هەڵسـەنگاندنی ناهومێدانـە بەرانبـەر بـە ڕووداو و خەڵـکەوە ٢. بەئێرەیی ☰ ١. بدبین ٢. حسود

**ڕەشپۆش / řeşpoş/**: ئاوەڵـناو. ١. جلـک‌ڕەش ٢. *[کنایە]* ئازیەتبار ☰ ١. سیاهپوش ٢. عزادار

**ڕەش‌پێست / řeşpêst/**: ئاوەڵـناو. سیاپێسـت؛ سیاپۆس؛ سەر بـە یـەکێک لـە چـوار دەسـتەی ڕەگەزی مـرۆڤ، ئـاکنجی قوڕنـەی ئـەفریقا کـە پێستی تاریک، مووی گرژ، لـووتی پـان و لێـوی ئەستووریان هەیە ☰ سیاهپوست

**ڕەشتاڵ / řeştał/**: ئاوەڵـناو. ڕەشتاڵـە؛ ڕەشـکار؛ ئەسمەری ئاماڵ‌ڕەش ☰ گندمگون

**ڕەشتاڵە / řeştałe/**: ☜ **ڕەشتاڵ**

**ڕەشتن / řeştin/**: ☜ **ڕەژتن**

**ڕەشتوو / restû/**: ئاوەڵناو. ڕەژیدە؛ ڕەنگ‌کێشـراو ☰ نقاشی شده

**ڕەشتووز[1] / restûz/**: نـاو. دەبـان؛ جـۆرێ تیخـی شمشێر و خەنجەر ☰ نوعی تیغ شمشیر و خنجر

**ڕەشتووز[2]**: ئاوەڵناو. ڕەشی بریقەدار ☰ سیاه براق

**ڕەشتەی / řeştey/**: چـاوگ. ڕەژتـن ‹لالـە گەردەن‌کەج تۆی دیدە ڕەشتەن/ گۆیا عەکس یـار وە رووشدا وەشتەن «مەولەوی»› ☰ رنگ کردن

**ڕەشتی / restî/**: ناو. شەدە؛ مشکی ‹سەفوەتی سۆفی لە شانە و ڕیشدا دەرناکەوێ/ نووری دەروێشی لە پرچ و ڕەشتی و کێشا نییە «ناری»› ☰ نوعی دستار

**ڕەش‌چیڤک / řeşçîvik/**: ☜ **ڕەشۆڵە**

**ڕەش‌چێلەک / řeşçêlek/**: ☜ **ڕەشۆڵە**

**ڕەشخوێن / řeşx(i)wên/**: ناو. کاری خوێندنـەوەی بە بێ مانا زانین 🇮🇷 روخوانی (بدون درک معنی)

**ڕەشدار / řeşdar/**: ناو. سیاچنار؛ سـنەوبەری ڕەش 🇮🇷 کاج سیاه

**ڕەشدەرمان / řeşderman/**: نـاو. گیـای سـیاوپووژ؛ سیاپۆش 🇮🇷 پرسیاوشان سیاه

**ڕەشڕشک / řeşřişik/**: نـاو. ١. زیـوان؛ دەنکێکـی ڕەشە دەگەڵ گـەنم ٢. ڕەشـکێنە؛ ڕەشڕەشـک؛ بیبیلەی چاو 🇮🇷 ١. دانەای سیاه در گندم ٢. مردُمک چشم

**ڕەشڕەشک / řeşřeşik/**: ☜ ڕەشڕشك ـ٢

**ڕەشک / řeşk/**: ناو. ١. بیبیلەی چاو ٢. سیان؛ قورم 🇮🇷 ١. مردُمک چشم ٢. دوده

▣ **ڕەشکا چاڤ:** ڕەشکێنەی چاو 🇮🇷 قرنیەی چشم

**ڕەشک / řeşik/**: ناو. ١. کاڵەمووبین ٢. پێڵاوی لـە لبـاد ٣. کـوێروو؛ نـاوی گشـتی بـڕێ نەخۆشـی قارچی دەغڵ و دان 🇮🇷 ١. پای‌افزار موین ٢. کفش نمدی ٣. سیاهک آفت غله

**ڕەشکار / řeşkar/**: ☜ ڕەشتاڵ

**ڕەشکوژ / řeşkuj/**: ناو. ١. تیرۆریست؛ کاربەدەستی تیرۆر یـان بـڕوادار بـە وا کارێـک ٢. تـیری بـێ نیشانە گرتن؛ گوللەی وێڵ ٣. تانجییەک کـە لـە ڕەشایی و شێوەردیشدا دەگاتە کەروێشـک 🇮🇷 ١. تروریست ٢. گلولەی بی هدف ٣. تازی چالاک

**ڕەشکوژی / řeşkujî/**: نـاو. ڕەشەکوژی؛ تەریەگەری؛ تیرۆر؛ کاری پەنامەکی بۆ کوشـتنی کەسـێک 🇮🇷 ترور

**ڕەشکوێت / řeşk(i)wêt/**: ناو. ئەسپی کویتی تۆخ 🇮🇷 کُمیت تیره

**ڕەشکۆیی / řeşkoyî/**: نـاو. جـۆرێ تـرێ 🇮🇷 نـوعی انگور

**ڕەشکە[1] / řeşke/**: نـاو. ١. سیاولـە؛ هەبـڕەش؛ دەنکێکی ڕەشی بۆنخۆشە بە نانییەوە دەکـەن ٢. دەفری گەوچن بۆ کا کێشان؛ تۆڕی کا کێشان ٣. ترێی ڕەش ٤. جۆرێ ترێی ڕەش ٥. تووتنی بـن گەڵای بێ‌نرخ 🇮🇷 ١. سیاەدانـە ٢. تـور کـاەکشـی ٣. انگور سیاه ٤. نوعی انگور سیاه ٥. توتون هرز

▪ **ڕەشکە[2]**: پاشەوشە. *[مەجاز]* نـزم و خـوار؛ ناڕەسـەن ‹مامەشەڕەشکە› 🇮🇷 بی‌مقدار

**ڕەشکەلە / řeşkele/**: ☜ ڕەشکەڵە

**ڕەشکەڵە / řeşkeƚe/**: ئاوەڵناو. ڕەشکەلە؛ ڕەشتاڵەی چکۆلە 🇮🇷 کوچولوی سیەچردە

**ڕەشکەن / řeşken/**: ☜ ڕەشانگ

**ڕەشکەوپێشکە / řeşkewpêşke/**: ناو. ڕەش‌وپـەش: ١. تەم و ڕەشایی بەرچاو لە بـەر بـێ‌حـوکمی ٢. *[کینایە]* خەتی تێکـەڵ ـ پێکـەڵ و نـاخۆش 🇮🇷 ١. حالت تـار دیـدن در اثـر کـم سـویی چشـم ٢. خـط خرچنگ ـ قورباغە

**ڕەشکەوسپیکە / řeşkews(i)pîke/**: نـاو. *[مـەجاز]* هەرزەمەشق؛ ڕاهێنانی خۆشنووسی بەتایبەت بـە قەڵەم زەل 🇮🇷 سیاەمشق

**ڕەشکەوگ / řeşkewig/**: ☜ ڕەشکەوە

**ڕەشکەوە / řeşkewe/**: ئاوەڵـناو. ڕەشـکەوگ؛ ڕەشکەوەگ؛ ڕەشی ئاماڵ شین 🇮🇷 سیاه مایـل بـە کبود

**ڕەشکەوەگ / řeşkeweg/**: ☜ ڕەشکەوە

**ڕەشکێنە / řeşkêne/**: نـاو. بیبیلـە؛ ڕەشڕەشـک 🇮🇷 مردُمک چشم

**ڕەشگرانی / řeşg(i)ranî/**: ناو. گرانـەتا؛ سـوورەیاو 🇮🇷 تیفوس

**ڕەشمار / řeşmar/**: نـاو. ١. مـارەڕەش؛ مـاری سیاڕەنگ ٢. ☜ ڕەشماڵ 🇮🇷 ١. مار سیاه ٢. ☜ ڕەشماڵ

**ڕەشماڵ / řeşmaƚ/**: نـاو. ڕەشمـار؛ تـاوڵ؛ کـۆن؛ سیاماڵ؛ کەوەنـدە؛ دەوار؛ دەواو؛ دووار؛ خێـوەتی ڕەشی لە موو چنراوی خێڵەکیان 🇮🇷 سیاەچادر

**ڕەشماڵنشـــــین / řeşmałn(i)şîn/**: ناوەڵــــناو. چادرنشـــــین؛ ڕەوەن؛ ڕەوەنـــــد ‹خێڵـــــە ڕەشمـــاڵنشـــینەکان هێشـــتا مـــاون›. هـــەروەها: **ڕەشماڵنشینی** ☰ چادرنشین

**ڕەشمە / řeşme/**: ناو. ڕێشمە؛ هەوساری ناسک کە دە سەر کەللە دەخرێ ☰ افسار نازک

**ڕەشمیری / řeşmîrî/**: نـاو. جـۆرێ تـرێ ڕەشــە ☰ نوعی انگور سیاه

**ڕەشمێو / řeşmêw/**: نـاو. دارە ترێیــەک کــە زوو پێدەگا ☰ تاکی که انگورش زودرس است

**ڕەشنووس / řeşnûs/**: ناو. پێشـنووس؛ چڵـکنووس ☰ پیشنویس

**ڕەشنە / řeşne/**: ناو. بەخت؛ شانس ☰ شانس

**ڕەشوبازگ / řeş û bazig/**: ☜ ڕەشبازگ

**ڕەشوبرش / řeş û birş/**: ناوەڵناو. *[کینایە]* زۆر ڕەش ☰ بسیار سیاه

**ڕەشوبەش / řeş û beş/**: ناوەڵناو. *[کینایە]* زۆر تاریک و بەسام ☰ بسیار تاریک و سهمگین

**ڕەشوپەش / řeş û peş/**: ☜ ڕەشکەوپێشکە

**ڕەشوڕووت / řeş û řût/**: ☜ ڕووتوڕەجاڵ

**ڕەشولە / řeşule/**: ☜ ڕەشۆڵە

**ڕەشوە / řeşwe/**: نـاو. ڕەشمــە؛ هەوســارێ کــە دە سەر کەللە دەخرێ ‹بە کام جێ کام گەوڕ کام نـاڵ و بزمار؟/ بە کام ڕەشوە و جـل و جلبەنـد و کورتـان؟ «قانع»› ☰ افسار نازک اسب

**ڕەشۆکی[١] / řeşokî/**: نـاو. جـۆرێ تفـەنگ ☰ نـوعی تفنگ

**ڕەشۆکی[٢]**: ناوەڵـناو. نارەسـەن و کـەمنـرخ ‹تـووتنی ڕەشۆکی› ☰ کم‌ارزش

**ڕەشۆڵە / řeşołe/**: ناو. ڕەش‌چێڤک؛ ڕەش‌چێلەک؛ ڕەشولە؛ ڕەشۆلی؛ ڕەشۆلێ؛ ڕەشـێلک؛ ڕەشـێلە؛ ڕەشێلە؛ ڕیشـۆل؛ ڕیشۆڵ؛ ڕیشۆلـە؛ ڕیشۆلـی؛ ڕیشۆلـێ؛ سێروو؛ گاوانی ☰ سار

**ڕەشۆلی / řeşolî/**: ☜ ڕەشۆڵە

**ڕەشۆلێ / řeşołê/**: ☜ ڕەشۆڵە

**ڕەشە[١] / řeşe/**: ناو. گەف؛ هەڕەشە ☰ تهدید

**• ڕەشە[٢]**: پاشەوشە. ١. *[مەجاز]* خراپ ‹قۆزەڕەشە› ٢. خاوەن ڕەشی ‹بەردەڕەشە› ☰ ١. بد ٢. سیاه

**ڕەشە •[٣]**: پێشوشـە. *[مەجاز]* ١. بــە ڕەنگــی ڕەش ‹ڕەشەتوو› ٢. سووک و ناشیرین ‹ڕەشــەدزی› ٣. خــراپ و نالــەبار ‹ڕەشــەبا› ٤. ناتــەواو؛ نیــوەچڵ ‹ڕەشـــەکێل› ٥. دەمـــارگرژ؛ تونـــد و تیـــژ ‹ڕەشەجوولەکە؛ ڕەشەموسڵمان› ٦. توند؛ ســەخت ‹ڕەشەگرانەتا؛ ڕەشەمەست› ☰ ١. سیاه ٢. زشـت ٣. بد ٤. ناتمام ٥. تعصب ٦. شدید

**ڕەشەئەرژەن / řeşe'erjen/**: ☜ ڕەشەهەرجنك

**ڕەشەبا / řeşeba/**: ناو. سیاوا؛ بای سـارد و تونـدی ڕۆژاوا ☰ باد دبور

**ڕەشەبرین / řeşeb(i)rîn/**: ☜ ڕەشەزام

**ڕەشەبی / řeşebî/**: ناو. سـیاویڕۆڵ؛ جـۆرێ دار بی ☰ بید سیاه

**ڕەشەتو / resetû/**: ناو. سوورەتوو ☰ شاەتوت

**ڕەشەجو / řeşecû/**: ناو. *[پلار]* جوولەکـەی پێـداگر لە دینی خۆیدا ☰ یهودی مُتعصب

**ڕەشەچاو / řeşeçaw/**: نـاو. گیـای سـیاچاو، بـۆ نەخۆشی فێ بەکەڵکە ☰ خربق

**ڕەشەچنار / řeşeç(i)nar/**: ناو. پەلک؛ جۆرێ داری چنار ☰ نوعی درخت چنار

**ڕەشەخێزان / řeşexêzan/**: ناو. *[پلار]* ماڵ و منداڵی زۆر و هــەرچی و پــەرچی ☰ خـانوادەی شـلوغ و آشفته

**ڕەشەدار / řeşedar/**: ناو. ١. نارەوەند ٢. داری بووز ☰ ١. درخت نارون ٢. درخت پشه

**ڕەشەداڵ / řeşedał/**: ناو. داڵ؛ داڵاش؛ داڵـەگورگە؛ لاشـخۆر؛ لاشـەخۆر؛ لاشـەوەر؛ باڵـندەیەکە لـە خێزانی داڵاشەکان سەر بە تۆرەمـەی هەڵـۆیان،

نزیک ٩٧ تا ١٠٥ سانتی‌میترە، لە شانە کوورە دەچێ بەڵام سەری زلترە و دندووکی ئەستوورترە، کلکی درێژ و سێسووچە، پەڕ و باڵی قاوەیی ئاماڵڕەشە، ملی رووتی چێرەیی ئاماڵ شینە و لە دەوری ئەستوورایی ملی پۆلێک تووکی قاوەیی رواوە، لە کێو و دەشتی دوورەدەستدا دەژی و لە سەر دار و ڕەوەزی لێواری هەڵدێران هێلانە دەکا دال سیاه

**ڕەشەڕاڤ** / řeşeřav/: ناو. ڕاوی ڕەشێنک؛ ڕاو لە کاتی نەبوونی بەفردا شکار در نبود برف

**ڕەشەڕێحانە** / řeşeřêĥane/: ناو. ڕێحانەی ڕەش کە بۆنی لە ڕێحانەی سپی خۆشترە ‹ڕەشەڕێحانە خۆمی پێ ڕەش کەم/ لە دوای بالاکەت دڵ بە کێ خوەش کەم؟ «فولکلۆر»› ریحان سیاه

**ڕەشەزام** / řeşezam/: ناو. ڕەشەبرین؛ سیازام؛ نەخۆشی چلکی هاوبەشی مرۆڤ و ئاژەڵ کە بە شێوەی کوانێکی چڵکی ناوڕەش هەڵدەدا سیاەزخم

**ڕەشەساڵ** / řeşesał/: ناو. وشکەساڵ؛ ئیشکەساڵ؛ ساڵی کەم‌باران خشکسال

**ڕەشەسیل** / řeşesîl/: ناو. دەردەباریکەی زۆر سەخت سل لاعلاج

**ڕەشەقەزوان** / řeşeqezwan/: ناو. ڕەشەوەن؛ وەنەسیاوێ بنەی کوهی

**ڕەشەک** / řeşek/: ناو. ١. گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ ٢. پێش‌نووس؛ پیس‌نووس؛ هەوەڵنووسین ١. گیاهی دارویی ٢. پیشنویس

**ڕەشەکوژی** / řeşekujî/: ☜ ڕەشکوژی

**ڕەشەکە** / řeşeke/: ئاوەڵناو. [پلار] خۆهەڵکێشی هیچ‌کارە لافزن بیکارە

**ڕەشەکەوتە** / řeşekewte/: ناو. تیراوێ؛ سیازام سیاەزخم

**ڕەشەگاور** / řeşegawir/: ناو. [پلار] خاچ‌پەرستی ڕکن لە سەر دین ترسای مُتعصب

**ڕەشەگرانەتا** / řeşeg(i)raneta/: ناو. ڕەشەگرانەتێ؛ کەوتوویی سەخت تیفوس شدید

**ڕەشەگرانەتی** / řeşeg(i)ranetî/: ناو. کەوتوویی؛ کەفتەیی؛ گرانەتا تیفوس

**ڕەشەگرانەتێ** / řeşeg(i)ranetê/: ☜ ڕەشەگرانەتا

**ڕەشەگزەر** / řeşeg(i)zer/: ☜ ڕەشەگەزەر

**ڕەشەگوێنی** / řeşeg(i)wênî/: ناو. جۆرێک گوێنییە، ڕەنگی لاسق و درووەکانی ڕەشە نوعی گَوَن

**ڕەشەگەزەر** / řeşegezer/: ناو. ڕەشەگزەر؛ گزەرگەسیاوێ شقاقُل

**ڕەشەگەون** / řeşegewin/: ناو. گوێنییەڕەشە گَوَن سیاه

**ڕەشەگیا** / řeşeg(i)ya/: ناو. گیایەکە بۆ لەوەڕ باشە گیاهی علوفەای

**ڕەشەمار** / řeşemar/: ناو. سیامار مار سیاه

**ڕەشەماڵ** / řeşemał/: ناو. گاڕەش؛ ڕەشەولاغ؛ گا و چێل و کەڵ و گامێش چهارپا؛ دام غیر از گوسفند و بز

**ڕەشەموسوڵمان** / řeşemusułman/: ناو. [پلار] موسوڵمانی سەروشک مسلمان خشک و مُتعصب

**ڕەشەمە** / řeşeme/: ناو. ڕەشەمێ: ١. پووڵان؛ دەلووف؛ ئاخر مانگی ساڵی ئێرانی، سێهەمین مانگی زستان کە ٢٩ ڕۆژە و چوار ساڵ جارێ دەبێتە ٣٠ ڕۆژ ٢. کاتی جووت بوونی پشیلە ٣. زوقم و سەرمای چەتوون ١. اسفندماه ٢. موسم جفتگیری گربە ٣. سرمای سخت

**ڕەشەمەس** / řeşemes/: ئاوەڵناو. سەرخۆشی زۆر مەست سیاەمست

**ڕەشەمەست** / řeşemest/: ئاوەڵناو. زەمر؛ مەستی مەست؛ بەدمەست؛ مەستی کەلەلا سیاەمست؛ پاتیل

**ڕەشەمێ** / řeşemê/: ☜ ڕەشەمە

**ڕەشەوار / řeşewar/**: ناو. سیامال 🇮🇷 سیاه‌چادر
**ڕەشەولاخ / řeşew(i)łax/**: ناو. ڕەشەولاغ؛ مالاتی بەرزە؛ گامێش و گاگۆل 🇮🇷 گاو و گاو میش
**ڕەشەولاغ / řeşew(i)łağ/**: ☜ ڕەشەولاخ
**ڕەشەوەن / řeşewen/**: ☜ ڕەشەقەزوان
**ڕەشەهەرجنک / řeşeherc(i)nik/**: ناو. هەجنەبایەم؛ ڕەشــەئەرژەن؛ نەهیڤەزاگرۆســی؛ دەوەن یــان دارێکی بچووکی پایا، تایبەتی ناوچەی گەرمێن و شێدار، بە لق و پۆی بێ‌درک، گەلای تاکی هێلکەیی، گوڵی تاکەیی یان بە کۆمەڵ و بەری ناوکەداری سوورەوە کە دوایی ڕەش دەبێ. چێوەکەی سووکە و لە پیشەسازیدا کەڵکی لێ دەبەن 🇮🇷 سیاه‌توسه
**ڕەشەهەرمێ / řeşehermê/**: ☜ هەرمێ ڕەشە
**ڕەشی**[1] **/ řeşî/**: ناو. ١. دژی چەرمگی ٢. *[مەجاز]* ئەو بەشە لە زەمین کە بەفرەکەی تواوەتەوە 🇮🇷 ١. سیاهی ٢. بخشی از زمین که برفش آب شده
**ڕەشی**[2]: ئاوەڵناو. ئازا و نەترس 🇮🇷 رشید
**ڕەشید / řeşîd/**: ئاوەڵناو. ئازا؛ بەجەرگ؛ جەرگ‌قایم؛ مەرخوز 🇮🇷 رشید
**ڕەشیش / řeşîş/**: ناو. نەرمەباران 🇮🇷 نم‌نم باران
**ڕەشیشە / řeşîşe/**: ناو. ١. تۆرەمەیەک باڵندەن، ڕەنگاوڕەنگ و دەنگ‌خۆشن، دندووکیان باریک و لاقیان بەهێزە، لە چەند خێزان پێکهاتوون: بۆقژەکان، بولبولەکان، بووکەسوورەکان، ڕەشیشەکان، کلک سوورەکان، کەڵەکەترەکان، گابەڵەکەکان، گەرووشینەکان ٢. باڵندەیەکە لە خێزانی ڕەشیشەکان، نزیک ٢٥ سانتی‌میترە، نێر لە مێ گەورەتر و تەواو ڕەشە، مێیە دندووک و بازنەی دەوری چاوی نارنجییە، ملی خاڵخاڵە و دندووکی قاوەیی کاڵە، نێرە بە باڕی قاوەیی ئامال ڕەش و دندووکی مەیلەو ڕەشە، لە سەر زەوی چینە دەکا، کلکی وەک چەتر لێ دەکا و قیت ڕایدەگرێ و بالان شۆڕ دەکاتەوە، لە لێڕەوار و باغاندا دەژی، لە نێو پەرژین و میچی تەویلە و هۆلان هێلانە ساز دەکا، زستانان زۆر دەبینرێ 🇮🇷 ١. تیره‌ای از پرندگان ٢. توکای سیاه
**ڕەشی‌مشی / řeşîm(i)şî/**: ناو. شەولەبان 🇮🇷 لولو
**ڕەشێلک / řeşêlik/**: ☜ ڕەشۆڵە
**ڕەشێلە / řeşêle/**: ☜ ڕەشۆڵە
**ڕەشێڵە / řeşêłe/**: ☜ ڕەشۆڵە
**ڕەشێنک / řeşênik/**: ناو. دۆخی توانەوەی بەفر و کەوتنە دەرەوەی خاک 🇮🇷 حالت آب شدن برف و آشکار شدن زمین
**ڕەشێنە / řeşêne/**: ناو. ڕەشکێنە؛ ڕشکێنە؛ بیبیلەی چاو 🇮🇷 مردُمک
**ڕەعاجاب / ře'acab/**: ناو. کاری پەروەردە کردن؛ ڕەنێو هێنان 🇮🇷 پرورش
**ڕەعت / ře't/**: ناو. ماندوویی؛ شەکەتی 🇮🇷 خستگی
**ڕەعیەت / ře'iyet/**: ناو. ڕایەت؛ گجە؛ جووتیارێک کە لە سەر زەوی ئاغا کار دەکا و لە گوندی ئاغاشا دەژی 🇮🇷 رعیّت
**ڕەغنە / řeğne/**: ☜ ڕەخنە
**ڕەغنەگر / řeğnegir/**: ☜ ڕەخنەگر
**ڕەف / řef/**: ناو. ١. ڕەڤ؛ پۆلی باڵدار لە کاتی فڕیندا ٢. ڕف؛ تاقەی زەق لە ماڵدا ٣. جوێن؛ جنێو؛ دژوێن 🇮🇷 ١. گروه پرنده در حال پرواز ٢. رف؛ تاقچه ٣. دُشنام
**ڕەفت / řeft/**: ناو. ڕەوت؛ شێوازی ڕێ چوون ‹ئەی خوا چەن خوەشە لە سەفەر بیتەو/ یار بە سۆنە ڕەفت بیتە پیریتەو «فولکلۆر»› 🇮🇷 سبکِ راه رفتن
**ڕەفتار / řeftar/**: ناو. ١. ئاکار؛ کردەوە ٢. تەرزی ڕێ چوون ‹چابوک بەو ڕەفتار بێ درەنگەوە/ هەرامان بەو ناز بالای شەنگەوە «مەولەوی»› 🇮🇷 ١. رفتار ٢. شیوه‌ی راه رفتن
**ڕەفتەنی / řeftenî/**: ئاوەڵناو. ڕەتەنی؛ ڕەوتەنی؛ لە

سەر ڕۆیشتن ≛ رفتنی

**ڕەفس / řefs/**: ☜ **ڕبس**

**ڕەفسان / řefsan/**: ☜ **ڕبسان**

**ڕەفساندن / řefsandin/**: ☜ **ڕبساندن**

**ڕەفک / řef(i)k/**: ☜ **ڕەفە**

**ڕەفکە / řefke/**: ☜ **ڕەفە**

**ڕەفە / řefe/**: ناو. ڕەفک؛ ڕەفکە؛ تاقەی زۆپ؛ ڕەف؛ ڕف؛ ڕفحە ≛ تاقچە؛ رف

**ڕەفی / řefî/**: ناو. ڕەخ؛ کەنار؛ لا ≛ کنار

**ڕەفیسک / řefîsk/**: ناو. ڕەفیسکە؛ ڕەپیسک؛ ڕەپڕەپیسک: ١. سیرمەی چەقی سەر و بنی ماسوولکە کە بە ئێسکەوە دەلکێت ٢. ڕەپیسکی بن ئەژنۆ ≛ ١. زردپی؛ تاندون ٢. زردپی پشت زانو

**ڕەفیسکە / řefîske/**: ☜ **ڕەفیسك**

**ڕەفیق / řefîq/**: ناو. ڕفێق؛ ڕفیق؛ ڕەفێق؛ هەواڵ؛ ئاواڵ؛ دۆست ≛ رفیق

**ڕەفیقایەتی / řefîqayetî/**: ناو. ڕەفێقی؛ هاواڵەتی؛ دۆستی؛ دۆستایەتی ≛ رفاقت

**ڕەفێق / řefêq/**: ☜ **ڕەفیق**

**ڕەفێقایەتی / řefêqayetî/**: ناو. هەواڵەتی؛ ئاواڵەتی؛ دۆستی ≛ رفاقت

**ڕەفێقی / řefêqî/**: ☜ **ڕەفیقایەتی**

**ڕەڤ / řev/**: ناو. ١. کاری هەڵاتن؛ باز دان لە ترسا ٢. ☜ **ڕەفـ١** ≛ ١. فرار ٢. ☜ **ڕەفـ١**

◘ **ڕەڤ تێکەتن:** هەڵاتن بە کۆ؛ دەست بە هەڵاتن کردنی خەڵک ≛ شروع کردن بە فرار دستەجمعی

**ڕەڤان / řevan/**: چاوگ. ڕەڤین؛ ڕەوان: ١. هەڵاتن؛ ڕاکردن؛ دەرچوون ٢. فڕان؛ ڕفان؛ ڕفیان ≛ ١. فرار کردن ٢. ربودە شدن

**ڕەڤاندن / řevandin/**: چاوگ. ڕەواندن؛ ڕەوانن: ١. ناچار بە هەڵاتن کردن ٢. فڕاندن؛ ڕفاندن ≛ ١. گریزاندن؛ وادار کردن بە فرار ٢. ربودن

**ڕەڤاندی / řevandî/**: ئاوەڵناو. ڕفاو؛ ڕفێنراو؛ ڕفیاگ ≛ ربودە شدە

**ڕەڤدە / řevde/**: ناو. کۆمەڵی جانەوەری کێوی ≛ رمە؛ گلەی جانواران وحشی

**ڕەڤڕەڤۆک / řevřevok/**: ئاوەڵناو. ترسەنۆک؛ ترسۆنەک؛ کەلەزات ≛ ترسو

**ڕەڤسە / řevse/**: ناو. گەڵادەرزی؛ گیایەکە لە تیرەی کەما ≛ گیاهی برگ سوزنی

**ڕەڤشت / řevişt/**: ☜ **ڕەوشت**

**ڕەڤشێلک / řevşêlik/**: ناو. قشقەڕە؛ قشقرە؛ قشقەڵە ≛ زاغی

**ڕەڤشێلە / řevşêle/**: ناو. شاباز ≛ شهباز

**ڕەڤگە / řevge/**: ناو. ڕەڤینگە: ١. ڕێبازی کۆی جانەوەرانی کێوی ٢. پەناگەی هەڵاتوان ≛ ١. گذرگاە جانوران وحشی ٢. پناهگاە فراریان

**ڕەڤۆ / řevo/**: ناو. کۆمەڵی ئەسپ و ئاژەڵ ≛ رمەی اسبان و دام

**ڕەڤۆک / řevok/**: ئاوەڵناو. ڕەڤەک؛ ڕەوەک؛ سڵ؛ قوشقی؛ تۆڕ ≛ رموک

**ڕەڤۆنەک / řevonek/**: ئاوەڵناو. گورگە؛ قاچاخ؛ هەڵاتووی خۆ وەشێر ≛ تحت تعقیب

**ڕەڤە / řeve/**: ناو. ڕەڤی: ١. کۆمەڵی ئاژەڵ و پاتاڵ ٢. کۆمەڵی یەکسم پێکەوە ≛ ١. گلە؛ رمە ٢. رمەی اسبان

**ڕەڤەک / řevek/**: ☜ **ڕەڤۆك**

**ڕەڤەڵ / řevel/**: ناو. تامان؛ دیواری لە شووڵ ≛ دیوار از ترکە بافتە

**ڕەڤی / řevî/**: ☜ **ڕەڤە**

**ڕەڤیڤان / řevîvan/**: ناو. مەیتەر؛ خزمەتکاری ئەسپ ≛ مهتر

**ڕەڤین / řevîn/**: ☜ **ڕەڤان**

**ڕەڤینگە / řevînge/**: ☜ **ڕەڤگە**

**ڕەڤینۆک / řevînok/**: ئاوەڵناو. شترفێن؛ بە

تایبەتمەندی شت ڕفاندنەوە ☰ رُباینده

**ڕەق¹ / ٍřeq/:** ☜ **ڕەقە¹**

**ڕەق²:** ئاوەڵناو. ١. سەخت؛ زەپ؛ زوها. بەرانبەر: نەرم ٢. ڕاست؛ ڕێک؛ بێ خواری ٣. دژوار؛ ئەستەم؛ چەتوون ٤. تاڵ؛ ناخۆش ‹قسەی ڕەق› ٥. سەرمابردوو ☰ ١. سخت؛ مُقابل نرم ٢. راست ٣. دشوار ۴. تلخ ۵. سرمازده

⊡ **ڕەق بردنەوە:** ١. مردن لە سەرما ‹زستانی پار سێ کەس لە هەوەتوو ڕەقیان بردەوە› ٢. تەزین و سەخت بوونی لەش لە زەبری سەرما ٣. [کینایە] زۆر سەرما بوون ‹دا ئەو دەرگا ببەسە! ڕەقمان بردەوە› ☰ ١. مُردن از سرما ٢. کرخ و سفت شدن بدن از سرما ٣. یخ کردن

**ڕەق بون:** ☜ **ڕەق هەڵاتن**

**ڕەق بونەوە:** ☜ **ڕەق هەڵاتن**

**ڕەق هەڵاتن:** ڕەق بوون/ بوونەوە/ هەڵگەڕان؛ ڕەقەڵاتن؛ ڕەقەو بوون: ١. مردن لە سەرمان ‹گەر لە برسان و لە بەر بێبەرگی ئیمڕۆ ڕەق هەڵێم/ نۆکەری بێگانە ناکەم تا لە سەر هەردم ئەمن «هێمن»› ٢. لە نەرمییەوە سەخت بوون ☰ ١. از سرما یخ زدن و مُردن ٢. سِفت شدن

**ڕەق هەڵگەڕان:** ☜ **ڕەق هەڵاتن**

**ڕەقەو بون:** ☜ **ڕەق هەڵاتن**

**ڕەق³:** ئاوەڵکار. ١. ڕەبەق؛ تەختوتەواو ‹ڕەق دوو مانگ ڕایانگرتم› ٢. وشک؛ بێ جووڵە ‹ڕەق ڕاوەستاوە› ☰ ١. عدل؛ دقیق ٢. ساکن؛ بی‌حرکت

- **ڕەق⁴:** پاشەوشە. سەخت ‹دڵڕەق› ☰ سخت

**ڕەق⁵:** دەنگەناو. دەنگی پێکدا دانی دوو شتی سەخت ☰ تَرَق

**ڕەقاشک / řeqaşik/:** ناو. ئامێری خەڕاتی ☰ وسیله‌ی خراطی

**ڕەقاڵ / řeqał/:** ☜ **ڕەقەڵ**

**ڕەقاڵە / řeqałe/:** ناو. ڕەوارە؛ پێچکی بێشکە ☰ پایه‌ی گهواره

**ڕەقامێر / řeqamêr/:** ناو. سەختامێر؛ ڕەقەواڵە ☰ سخت‌افزار

**ڕەقان¹ / řeqan/:** چاوگ. دەنگ لە شتی سەخت هاتن ☰ صدا از جسم سخت آمدن

**ڕەقان²:** ☜ **ڕەقانە**

**ڕەقاندن / řeqandin/:** چاوگ. تێپەر. //ڕەقاندت؛ دەڕەقێنی؛ بڕەقێنە// ڕەقان؛ کوتانی کانزا بە کانزا ☰ کوبیدن فلز با فلز

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەڕەقاندن

**ڕەقاندنەوە / řeqand(i)newe/:** چاوگ. ١. بە نهێم گوشار دان و لکاندنە شوێنێکدا ٢. ناسک کردنەوەی شتی وەک دەمەداس بە چەکوش و ... ٣. ڕەقاننەوە؛ لە سەر قسەیەک زۆر چوون ☰ ١. فشار دادن و چسباندن ٢. نازک کردن تیغه‌ی داس با چکش ٣. کِش دادن

**ڕەقانن / řeqanin/:** ☜ **ڕەقاندن**

**ڕەقاننەوە / řeqannewe/:** ☜ **ڕەقاندنەوە ـ٣**

**ڕەقانە / řeqane/:** ناو. ڕەقانی؛ ڕەقان؛ ڕەقەن؛ ڕەقێن؛ تمتم؛ تمتمان؛ زەوینێ کە بۆ کێڵان نابێ ☰ زمین سخت و سنگی

**ڕەقانی / řeqanî/:** ☜ **ڕەقانە**

**ڕەقایی / řeqayî/:** ناو. شوێنی سەخت ☰ جای سفت و سخت

**ڕەقبو / řeqbû/:** ☜ **ڕەقهەڵاتو**

**ڕەقبوگ / řeqbûg/:** ☜ **ڕەقهەڵاتو**

**ڕەق ـ ڕەق / řeq řeq/:** دەنگەناو. ڕەپەڕەپ؛ خرمە و گرمە ☰ صدای مهیب

**ڕەقڕەقاندن / řeqřeqandin/:** چاوگ. ددان لێک ساوین و جیڕە و سیڕە لێ هێنانی ☰ دندان بر هم ساییدن و صدا درآوردن

**ڕەقس / řeqs/:** ناو. زەما؛ سەما؛ لەیس ☰ رقص

**ڕەقساندن / řeqsandin/:** چاوگ. هەڵپەڕاندن؛

خستنە سەماوە ☰ رقصانیدن

**ڕەقسای / řeqsay/:** چاوگ. ڕەقسین ‹مەڕەقسان وە هەم مەکەردن شادی/ مەژەندن مەقام موبارەکبادی «*شانامەی کوردی*»› ☰ رقصیدن

**ڕەقسین / řeqsîn/:** چاوگ. تێپەڕ. //ڕەقسیت؛ دەڕەقسی؛ بڕەقسە// هەڵپەڕین ☰ رقصیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ڕەقسیو/ چاوگی نەرێنی: نەڕەقسین

**ڕەقشاندن / řeqşandin/:** چاوگ. پرژاندن؛ پڕژانن؛ ڕەشاندن ☰ پاشیدن

**ڕەقشین / řeqşîn/:** چاوگ. پرژان؛ پژیان ☰ پاشیده شدن

**ڕەقف / řeqf/:** ناو. سەنگفەرش؛ بەردەڕێژ؛ سەلبەند؛ شوێنێ کە بە توێژێ لە بەرد داپۆشراوە ☰ سنگفرش

**ڕەقفاندن / řeqfandin/:** چاوگ. بەردەڕێژ کردن؛ سەنگفەرش کردن ☰ سنگفرش کردن

**ڕەقک / řeqik/:** ناو. سن؛ سوون؛ کیسەڵە؛ بەلای گەنم ☰ سِن آفت گندم

**ڕەق‌وتەق / řeq û teq/:** ئاوەڵناو. *[پلار]* ڕەق‌وڕەواڵ: ١. ڕەق‌ووشک؛ دالگۆشت؛ لاواز ‹پیاوێکی ڕەق‌وتەق داری ئەشکاند› ٢. بێ‌کەل‌وپەل و ڕایەخ ‹پیرەژن ماوە و ماڵێکی ڕەق‌وتەق› ٣. *[مەجاز]* سەخت و دژوار و ناخۆش ‹دەقی ڕەق‌وتەق؛ شیعری ڕەق‌وتەق› ٤. سفت؛ وشک و ڕەق ‹شەو لە سەر ئەرزی ڕەق‌وتەق خەوتم› ☰ ١. لاغر مردنی ٢. بی‌اثاثیه و زیرانداز ٣. دشوار ۴. سخت

**ڕەق‌وڕەواڵ / řeq û řewał/:** ☜ ڕەق‌وتەق

**ڕەق‌ووشک / řeq û wişk/:** ☜ ڕەق‌وتەق-١

**ڕەقە[1] / řeqe/:** ناو. ڕەق؛ ڕەقیاو؛ کیسەڵی ناو ئاو ☰ کَشَف؛ لاکپشت آبی

**ڕەقە[2]:** پێزۆ. ← تەقەوڕەقە

**ڕەقەک / řeqek/:** ناو. سن؛ قمل؛ سوون ☰ حشرەی سِن

**ڕەقەڵ / řeqeł/:** ئاوەڵناو. ڕەقاڵ؛ ڕەقەڵە؛ دالگۆشت؛ لاواز؛ لەڕ؛ لەجەر ☰ لاغر

**ڕەقەڵاتن / řeqełatin/:** ☜ ڕەق هەڵاتن

**ڕەقەڵاتوو / řeqełatû/:** ☜ ڕەق‌هەڵاتوو

**ڕەقەڵە[1] / řeqele/:** ناو. کەشکەژنۆ؛ ئێسکی سەر ئەژنۆ؛ پێشەی بان زرانی ☰ کشکک

**ڕەقەڵە[2]:** ☜ ڕەقەڵ

**ڕەقەمار / řeqemar/:** ناو. سفرەمار؛ جۆرێ مار ☰ نوعی مار

**ڕەقەمەلاژ / řeqemełaj/:** ناو. ئێسکەمەلاژ؛ بەری پێشەوەی مەلاشوو کە لە دوو ئێسکی مەلاژ پێکهاتووە ☰ سخت‌کامە

**ڕەقەن / řeqen/:** ☜ ڕەقانە

**ڕەقەواڵە / řeqewałe/:** ☜ ڕەقامێز

**ڕەقەوبوگ / řeqewbûg/:** ☜ ڕەق‌هەڵاتوو

**ڕەق‌هەڵاتوو / řeqhełatû/:** ئاوەڵناو. ڕەق‌بوو؛ ڕەق‌بووگ؛ ڕەقەڵاتوو؛ ڕەقەوبووگ: ١. لە سەرمان مردوو ٢. سەختەوەبوو ☰ ١. یخزده از سرما ٢. سفت شده

**ڕەقی / řeqî/:** ناو. ١. جۆرێ سابوونی خۆماڵی ‹سابوونی کەفی پێیە کەفی زاری چاپلووس/ خاسییەتی ڕەقی هەیە نەرمی زوبانی لووس «*نالی*»› ٢. سەختی؛ زەبی؛ گرژی؛ گوژمی؛ پتەوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ڕەق بوون ‹بە ڕەقی بەرد› ☰ ١. نوعی صابون ٢. سختی؛ سفتی

**ڕەقیاو / řeqyaw/:** ☜ ڕەقە[1]

**ڕەقیتە / řeqîte/:** ناو. ١. نەخۆشی لەش ڕەق بوون لە سەرما ٢. قەتماخە؛ ڕەقێنە؛ پەترۆکی برین ٣. جلکی لە چلکدا ڕەق بوو ☰ ١. بیماری سفت شدن اندام از شدت سرما ٢. خون خشکیدەی روی زخم ٣. لباس خشک شده از چرک

⊡ **ڕەقیتە بەستن:** ڕەقیتە هەڵێنان؛ ڕەق بوونی

جلک لە چلکدا 🇮🇷 چرک‌خشک شدن لباس

**ڕەقیتە هەڵێنان:** ☜ **ڕەقیتە بەستن**

**ڕەقینە** / řeqîne/: ☜ **ڕەقێڵە**

**ڕەقێڵە** / řeqêłe/: ناو. ڕەقینە؛ کەمێڵ؛ سلەمەڕ کە بە بەر دووگە و لاقی مەڕەوە نووساوە 🇮🇷 گال

⊡ **ڕەقێڵە بەستن:** چلک و پیسایی زۆر پێوە نووسان ڕەق هەڵاتن 🇮🇷 گال بستن

**ڕەقێن**[١] / řeqên/: ☜ **ڕەقانە**

– **ڕەقێن**[٢]: پاشەوشە. بە کانزا لە کانزادەر ‹دەرگاڕەقێن› 🇮🇷 کوبندەی فلز با فلز

**ڕەقێنە** / řeqêne/: ناو. ١. ڕەقیتە؛ قەتماخە؛ پەتروکی برین ٢. ئێسکی لوولاک؛ پێشەی پووز و بەلەک ٣. کرکرۆکە؛ کرۆژنە؛ چەشنێک شانەی پێوەندی، نەرمتر لە ئێسک کە سەرچاوەی شانەی ئێسکە 🇮🇷 ١. خون خشکیدەی روی زخم ٢. استخوان ساق ٣. غضروف

**ڕەکات** / řekat/: ☜ **ڕکات**

**ڕەکە** / řeke/: ناو. هەوراز 🇮🇷 سربالایی

**ڕەکێشە** / řekêşe/: ☜ **ڕکێشە**

**ڕەگ** / řeg/: ناو. ١. ڕەی؛ ڕێ، ڕیتگە؛ گیف؛ ڕۆگەی باریک و ناسکی خوێن لە مۆرغەداراندا ٢. پنج؛ پنجک؛ بەشی بنەهەردی گیای تۆمدار ٣. ڕینج؛ چینی جیاوازی ناو خاک و بەرد ٤. ڕەگە؛ ڕەگەز؛ نەژاد ٥. بنەڕەت؛ تۆرەمە؛ بنەچەک 🇮🇷 ١. رگ ٢. ریشە ٣. رگە ۴. نژاد ۵. اصل؛ نژاد

⊡ **ڕەگ پێدا هاتن:** شیر زانە مەمکی ژن 🇮🇷 رگ کردن پستان

**ڕەگ داکوتان:** توند بوونی ڕەگی ڕووەک لە زەمین 🇮🇷 ریشە دوانیدن

**ڕەگی لامل دەرپەڕان:** [کینایە] زۆر تووڕە بوون 🇮🇷 رگ گردن بیرون آمدن

**بێڕەگ بوون:** [مەجاز] بێ‌غیرەت بوون 🇮🇷 غیرت نداشتن

**لە ڕەگ دەرهێنان:** [کینایە] لە ڕەگ و ڕیشە دەرهێنان؛ تەواو لە ڕێخەوبنە دەرهێنان ‹سەیلی هیجرت، بەردی بنچینەی لە ڕەگ هێنامە دەر/ باری فیکرت، قەددی ڕاستی تێشکاندم وەک فەنەر «نالی»› 🇮🇷 از رگ و ریشە درآوردن

**ڕەگاژۆ** / řegajo/: ناو. ڕیشاژۆ؛ دۆخی لە سەر ڕیشە سەوز بوونەوە و پەرە سەندنی دار 🇮🇷 روی ریشە جوانە زدن و دوبارە سبز شدن درخت

**ڕەگاژۆیی** / řegajoyî/: ناو. دزە؛ ڕەوتی ڕێگە خۆش کردن بۆ ناو شتێک و تێیدا دامەزران 🇮🇷 رسوخ

**ڕەگاوڕەگ** / řegawřeg/: ↓

⊡ **ڕەگاوڕەگ بوون/ کەوتن:** ڕێ گێڵەی؛ تاک و لۆ کەوتنی ماسوولکەی لەش، بە هۆی تەوژمی زۆرەوە ‹دانەویمەوە بەردەکە هەڵگرم، پشتم ڕەگاوڕەگ بوو› 🇮🇷 رگ‌بەرگ شدن

**ڕەگبڕە** / řegb(i)ře/: ناو. مڵە؛ جۆبڕە 🇮🇷 آبدُزدک

**ڕەگبەس** / řegbes/: ناو. ئامێرێ بۆ بەستنی سووڕەڕەگێکی لەش، بریتی لە لوولەیەکی لاستیکی باریک بە قولاپێک لە سەرییەوە 🇮🇷 رگبند

**ڕەگدار** / řegdar/: ئاوەڵناو. بەبن 🇮🇷 ریشەدار

**ڕەگژی** / řegjî/: ناو. ١. ڕەگەز ٢. ڕیشە؛ ڕەگ 🇮🇷 ١. نژاد ٢. ریشە

**ڕەگناسی** / řegnasî/: ناو. زانستی لێکۆڵینەوە لە ڕەگ و کۆئەندامی لەنفی 🇮🇷 رگ‌شناسی

**ڕەگ و ڕیشە** / řeg û řîşe/: ناو. بنەچە؛ ڕەچەڵەگ؛ لان و لکووت؛ توو و تۆرەمە 🇮🇷 رگ‌وریشە

**ڕەگە** / řege/: ناو. ١. ڕەگ؛ ڕیزە؛ قەتارە؛ ڕەج؛ هێڵێ کە لە پاڵ یەک دانانی چەن شتی وەک یەک پێک دێت ‹ڕەگەیێ خشت، ڕەگەیێ بەرد› ٢. ڕەگەز ‹دوو ڕەگە› 🇮🇷 ١. رَج ٢. نژاد

**ڕەگەڕووتە** / řegeřûte/: ناو. دەرمانەئازار؛ گوڵەدەوری؛ گوڵەئێش 🇮🇷 عاقرقرحا

**ڕەگەز / řegez/:** ناو. ڕەگەما؛ بنچینە؛ بنیچە؛ نـژاد؛ نەژاد؛ سـۆلان؛ ڕەسـەن؛ ڕەگ؛ ڕەگـژی؛ چـین؛ بنـەڕەت؛ تۆرەمـە؛ تۆمـە؛ تەرەکـە؛ تۆخمـە؛ ڕەچەڵـەک؛ بنەچـەک؛ بنەچـەق؛ بنەچەکـە؛ بنرچڵەک؛ توخم؛ خیم؛ کۆک؛ ڕەتەوە؛ تروم؛ وەچ و بـەرە؛ نـوادە؛ لانـەما؛ لانـەزێ؛ لان؛ نەتـەوە؛ ڕیشەڵۆک؛ ڕشتارە؛ ڕاجە؛ سووە؛ سومارە؛ نەسەوە؛ لانلکووت: ۱. تاقمێ لە گیاندارانی سەر بە یەک تیرە، کە نێر و مێیـان پێکـەوە جـووت دەبـن ۲. دەستەیەک لە خەڵک، بە شێوە و ڕواڵەتی وەکوو یەک (وەک: ڕەنگی پێست، قـژ یـان چـاو) ۳. هـۆز یان خەڵکی هاوپشـت ‹تـیرە و ڕەگـەزی کـوردی کوردستان/ ئەوەندە زۆرن نایەنـە بـەیان «قـانع»› ٤. خەڵکی سەر بە یەک هۆز و گەل ≡ ۱تا۴. نژاد

**ڕەگەزپەرست / řegezperist/:** ناو. نەژادپەرسـت ≡ نژادپرست

**ڕەگـەزچـرووک / řegezç(i)rûk/:** ناوەلـناو. [پـلار] ناجسن؛ بنیچە خوێڕی ≡ نانجیب

**ڕەگەزناس / řegeznas/:** ناو. پسپۆڕ لە دەرخستنی ڕەگەز و بنەماکان ≡ نژادشناس

**ڕەگەزنامە / řegezname/:** ناو. ڕەتەوە؛ شەجەرە ≡ شجرەنامە

**ڕەگەڵ / řegeł/:** ئامراز. دەگەڵ؛ پێڕا ≡ با؛ همراه

**ڕەگەڵ ـ ڕەگـەڵ / řegeł řegeł/:** ناوەلناو. لاپرەسەن؛ لاپلار؛ لاکوت؛ خۆهەڵقوتێن ≡ فضول

**ڕەگەما / řegema/:** ☜ **ڕەگەز**

**ڕەڵم / řełm/:** ناو. زیخ؛ چەو ≡ رَمل

**ڕەڵماوی / řełmawî/:** ☜ **ڕێخناخ ـ۱**

**ڕەم / řem/:** ناو. ۱. ڕەڤ ۲. ڕەڤە ۳. شیاکە؛ ڕیـخ؛ گووگا ≡ ۱. رم ۲. رمە ۳. سرگین

⊡ **ڕەم کردن:** ڕەوینەوە؛ هەڵاتن ‹چو کاوڕ وە گورگ لە لی ڕەم کردم/ یەی پـا هاتـە وەر سـێ پـا دوور گردم «شامی»› ≡ رم کردن

**ڕەماندن / řemandin/:** چاوگ. ڕەپێ نان؛ ڕەواندن؛ تاراندن ≡ تاراندن

**ڕەمانن / řemanin/:** چـاوگ. ڕەواندنەوە؛ ترسـاندن و تاراندن ≡ رماندن

**ڕەمانە / řemane/:** ناو. ۱. ڕمانە؛ جۆرێک داس ۲. قووڵایی بن زرانی ۳. جۆرێ دانەوێڵە لە چەشنی هەرزن و دێمیلە کە نانی لێ دروست دەکـەن ≡ ۱. نوعی داس ۲. گـودی زیـر زانـو ۳. نـوعی دانـەی گیاهی کە از آن نان می‌سازند

⊡ **ڕەمانـە کـردن:** بـڕینی ڕەفیسـکەی ئەسـپ و حەیوانی تر بۆ ئەوەی نـەتوانێ بـڕوا ≡ بُریـدن زردپی حیوان کە از راه رفتن بازمانَد

**ڕەمـای / řemay/:** چـاوگ. ۱. ڕاکـردن ‹سـەمای دەسمالان ڕەمای نەوهالان/ تـەمای مـەلالان نـەمای وەشحالان «مەولەوی»› ۲. ڕەوین؛ سڵـەمین ≡ ۱. فرار کردن ۲. رمیدن

**ڕەمایۆ / řemayo/:** ☜ **ڕەوانەوە**

**ڕەمز / řemz/:** نـاو. ۱. سـڕ؛ نهـێنی؛ ڕاز ۲. چەنـد ژمارە یان پیتی نهێنی بـۆ کردنـەوەی شـتێ ۳. ڕازی دەسکەوتنی شتێ یان شـێوەی جێبـەجێ کردنی کارێک ‹ڕەمزی سەرکەوتن› ≡ ۱. راز ۲و۳. رمز

**ڕەمزاوی / řemzawî/:** ناوەلـناو. ڕەمـزی؛ نادیـار ≡ مبهم؛ مرموز

**ڕەمزی / řemzî/:** ناوەلناو. ۱. ڕەمزدار ۲. ڕەمـزاوی؛ نادیار ≡ ۱. رمزدار ۲. مَرموز

**ڕەمکار / řemkar/:** ☜ **ڕەمکەر**

**ڕەمکـەر / řemker/:** ناوەلـناو. ڕەمکـار؛ ڕەڤـۆک ≡ رموک

**ڕەمکێش / řemkêş/:** نـاو. پێشـەنگ؛ سـەرگەلە ≡ پیشاهنگ گلە و رمە

**ڕەمل / řem(i)l/:** ناو. سیلک ≡ ریگ

**ڕەملس / řemlis/:** ناو. جۆرێ هەرزن ≡ نوعی ارزن

**ڕەمڵ / ř̄em(i)ł/**: ناو. ١. ڕەڵم؛ زیخ؛ چەو؛ ورکە بەردی وا بە دەم باوە بڕوا ٢. ئامرازی کاری فالگر ٣. تەمی بەر چاو لە سۆنگەی چاوێشەوە ☰ ١. رمل ٢. ابزار کار فالبین ٣. تاری چشم ناشی از چشم‌درد

◘ **ڕەمڵ کردن**: چاو دە ڕێشکەوپێشکە چوون ☰ سیاهی رفتن چشم

**ڕەمڵ گرتنەوە**: چوونە لای فالگرەوە بۆ بەخت خوێندنەوە ☰ پیش رمال رفتن برای طالع‌بینی

**ڕەمڵ لێدان**: خێرە گرتنەوە ☰ رمالی کردن

**ڕەمڵگرەوە / ř̄em(i)łg(i)rewe/**: ناو. فالگر؛ گیرزان؛ قەپالگر؛ خیپک ☰ فالبین؛ رمال

**ڕەملی / ř̄emłî/**: ئاوەڵناو. کۆکک؛ لماوی ☰ شنزار

**ڕەمنای / ř̄emnay/**: چاوگ. ڕا پێ‌کردن ☰ دواندن

**ڕەمۆک / ř̄emok/**: ☜ ڕەوەك

**ڕەموزن / ř̄emûzîn/**: ☜ ڕەموزن

**ڕەمە / ř̄eme/**: ناو. ڕەم؛ ڕەڤە؛ کۆمەڵێ حەیوان پێکەوە ☰ رمه

**ڕەمەرانە / ř̄emerane/**: ناو. هەرزن؛ ئەرزن ☰ ارزن

**ڕەمەزان / ř̄emezan/**: ناو. مانگی نۆهەمی ساڵی کۆچی ـ مانگی و کاتی ڕۆژوو گرتنی موسوڵمانان ☰ رمضان

**ڕەمەکی[1] / ř̄emekî/**: ناو. ڕەوەکی: ١. ڕەشەولاخ؛ مالاتی بەرزە ٢. مالاتی بەرزەی شەو بە کێو ٣. *[پلار]* مرۆی کەس‌نەناس و لە چینی خوار ☰ ١. گاو و گاومیش ٢. گاو و گاومیشی که شب در چراگاه بماند ٣. عوام

**ڕەمەکی[2]**: ئاوەڵناو. ١. ڕەوەکی: ئاسایی ‹خەڵکی ڕەمەکی› ٢. گۆترە؛ هەروایی ‹کاری ڕەمەکی› ☰ ١. عادی؛ معمولی ٢. الکی

**ڕەمەکی[3]**: ئاوەڵکار. ١. گۆترە؛ بە بێ بەراورد ‹ڕەمەکی نرخی بۆ داناوە› ٢. هەروا؛ بێ هۆ ‹ڕەمەکی جواب دەداتەوە› ☰ ١. تخمینی ٢. الکی

**ڕەمەل / ř̄emel/**: ناو. کێشێکی شیعری عەرووزی ☰ رَمَل

**ڕەمەن / ř̄emen/**: ئاوەڵناو. ١. وشکەچن (دیوار) ٢. سڵ؛ ڕەڤۆک؛ ڕەوەک ☰ ١. بی‌ملات (دیوار) ٢. رموک

**ڕەمیا / ř̄emya/**: ئاوەڵناو. ڕاکردوو؛ هەلاتوو ☰ فراری

**ڕەمین / ř̄emîn/**: چاوگ. ڕەمینەوە؛ سڵ کردن ☰ رمیدن

**ڕەمینەوە / ř̄emînewe/**: ☜ ڕەمین

**ڕەن / ř̄en/**: ناو. ١. خۆیانی ڕاخراوی هێشتا گێرەنەکراو ٢. ئەو ئەنازە لە ئالف کە بە جارێ دروێنە دەکرێ ٣. زەوی بە بەر و بوومی قەراخ چەم ☰ ١. غله‌ی پهن شده برای کوبیدن ٢. علف حاصل از یک بار درو ٣. زمین حاصلخیز کنار رودخانه

**ڕەنج[1] / ř̄enc/**: ناو. ١. ئازار ٢. کاری سەخت؛ ئەرکی گران ☰ ١. رنج ٢. کار سخت

▣ **ڕەنجی قالۆنچە**: *[کینایە]* کار و زەحمەتی خۆڕایی ☰ کار و زحمت بیهوده

◘ **ڕەنج بە خەسار/ زایە چوون**: ڕەنجەڕۆ بوون؛ ڕەنج‌بەبا بوون ☰ رنج بر باد رفتن

**ڕەنج دان**: زەحمەت کێشان؛ ئەرکی گران کردن ☰ زحمت کشیدن

• **ڕەنج[2]**: پاشەوشە. بەرەنج ‹زوورەنج› ☰ ـ رنج

**ڕەنجان / ř̄encan/**: چاوگ. تێنەپەر. //ڕەنجای؛ دەڕەنجێ؛ بڕەنجێ// ڕەنجیان؛ ڕەنجین؛ دڵ شکان؛ ناڕەحەت بوون ☰ رنجیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ڕەنجاو/ چاوگی نەرێنی: نەڕەنجان

**ڕەنجاندن / ř̄encandin/**: چاوگ. تێپەر. //ڕەنجاندت؛ دەڕەنجێنی؛ بڕەنجێنە// ڕەنجانن؛ دڵ شکاندن ‹ڕەنگە جەستەی من شووشەی پۆلا بێ/ هێند بیرەنجێنین هێشتا هەر مابێ «پیرەمێرد»› ☰

رنجانیدن؛ آزُردن
■ ئاوەڵناوی بەرکاری: —/ چاوگی نەرێنی: نەڕەنجاندن
**ڕەنجانن / řencanin/**: ☜ **ڕەنجاندن**
**ڕەنجاو / řencaw/**: ئاوەڵناو. ڕەنجیاگ؛ دڵئێشاو ☰ رَنجیده
**ڕەنجای / řencay/**: چاوگ. ڕەنجان ‹جە سای دووی دەروون سەودایی بێشۆ/ نەڕەنجۆ سەفحەی لای سەوزەی وەشبۆ «مەولەوی»› ☰ رنجیدن
**ڕەنجبەبا / řencbeba/**: ئاوەڵناو. ڕەنجەڕۆ؛ ڕەنجبیوەر؛ ڕەنجبێوەر؛ ڕەنجبەباچوو؛ تایبەتمەندی کەسێ کە بەهرەی لە ئەرکی خۆی پێ نەگەیشتووە ☰ رنج برباد
**ڕەنجبەباچو / řencbebaçû/**: ☜ **ڕەنجبەبا**
**ڕەنجبەخەسار / řencbexesar/**: ئاوەڵناو. ڕەنجەڕۆ؛ ڕێژگاو ☰ رنج برباد
**ڕەنجبەر / řencber/**: ناو. ڕینجبەر؛ ڕێنجەبەر؛ ڕێژبەر: ١. وەرزێری بە کرێ بۆ خەڵک ٢. ڕەنجدەر؛ زەحمەتکێش ☰ ١. خوش‌نشین ٢. رنجبر
**ڕەنجبیوەر / řencbîwer/**: ☜ **ڕەنجبەبا**
**ڕەنجبێوەر / řencbêwer/**: ☜ **ڕەنجبەبا**
**ڕەنجدەر / řencder/**: ناو. ڕەنجبەر؛ ئەرکگران ☰ رنجبر
**ڕەنجنای / řenc(i)nay/**: چاوگ. ڕەنجاندن ☰ رنجاندن
**ڕەنجەڕۆ / řenceřo/**: ☜ **ڕەنجبەبا**
**ڕەنجەڕۆیی / řenceřoyî/**: ناو. کاری زەحمەت کێشانی بێ بەهرە و بە خۆڕایی ‹گەرچی تووشی ڕەنجەڕۆیی و حەسرەت و دەردم ئەمن/ قەت لە دەس ئەم چەرخە سپڵە نابەزم، مەردم ئەمن «هێمن»› ☰ رنج بربادی
**ڕەنجیاگ / řenc(i)yag/**: ☜ **ڕەنجاو**
**ڕەنجیان / řenc(i)yan/**: ☜ **ڕەنجان**
**ڕەنجیای / řenc(i)yay/**: چاوگ. ڕەنجان ‹خواجەی ساحێب شەرت چی ڕەنجیانی؟/ مەیلت، مۆبەتت، هیچکام نەمەندەن «سەیدی»› ☰ رنجیدن
**ڕەنجین / řencîn/**: ☜ **ڕەنجان**
**ڕەنجێن / řencên/**: ئاوەڵناو. ڕەنجپێدەر؛ ئازاردەر ☰ آزارده
**ڕەند[1] / řend/**: ناو. ١. ئاد؛ چزیرگە؛ زەوینی گچکەی هەر چوار لا ئاو ٢. تەختایی ناو گردان ☰ ١. جزیرەی کوچک ٢. زمین هموار میان تپەها
**ڕەند[2]**: ئاوەڵناو. ١. مێرخاس؛ جوامێر ‹خوشا ڕەندێ لە دنیا بێ‌موبالات و موجەڕڕەد بێ/ بە ڕۆژ زیندەی جەماعەت بێ، بە شەو مات و موجەڕڕەد بێ! «نالی»› ٢. جوان؛ خوشیک ‹شەیدای شێوەی ڕەند پەری سامت بام/ دیوانەی ڕوخسار جەمین جامت بام «سەیدی»› ☰ ١. رادمرد ٢. زیبا
**ڕەندش[1] / řendiş/**: چاوگ. ڕنین ☰ خراشیدن
**ڕەندش[2]**: ناو. ڕەندەی نەجاری ☰ رندەی نجاری
**ڕەندول / řendul/**: ئاوەڵناو. ڕەندۆڵ؛ زورهان؛ پیری لە کارکەوتە ☰ پیر و فرتوت
**ڕەندۆڵ[1] / řendoł/**: ناو. ١. ئاودڕی گوشاد ٢. دۆڵچەی ئاو کێشان ☰ ١. آبکند فراخ ٢. دلو آبکشی
**ڕەندۆڵ[2]**: ☜ **ڕەندول**
**ڕەندۆڵک / řendołik/**: ناو. گیایەکە لە کەنگر دەکا ☰ گیاهی شبیه کنگر
**ڕەندە / řende/**: ناو. ڕنە؛ ڕەنە؛ ڕەندەتی؛ ڕننە: ١. ڕەندەش؛ کوشتەرە؛ کەشتەرا؛ ئامرازی نەجار بۆ لووس‌کردنی دار ٢. ڕنکە؛ پەڕەیەکی کون‌ـکونە بۆ وردکردنی بڕێ خواردەمەنی تورت (وەک: پیواز، سێفەزەمینە و...) ☰ ١و٢. رنده
**ڕەندەتی / řendetî/**: ☜ **ڕەندە**
**ڕەندەش / řendeş/**: ☜ **ڕەندە ـ١**
**ڕەندی / rendî/**: ناو. ناوی هەڵپەڕکێیەکی کوردییە

☰ از رقص‌های کردی

**ڕەنك / řenik/:** ناو. هەرچی پەڵە خاوێن دەکاتەوە ☰ پاک‌کُن

**ڕەنگ[1] / řeng/:** ناو. ١. چڕ؛ بێز؛ ڕەژدە؛ دیاردەی نووری یا پێزانینی چاو کە دەبێتە هۆی ئەوەی شتان لێک جیا بکرێنەوە ٢. هەرکام لە درێژاییەکانی شەپۆلی تیشک کە لە تەنێکەوە دەردەکەوێ و ئەبێتە هۆی دیتنی ‹ڕەنگی سپی› ٣. بۆیاخ؛ ماک یان پێکهاتەیێ کە ڕەنگ دەدا بە شت ‹برۆ قوتوویێ ڕەنگ بکرە!› ٤. واش؛ بار؛ جۆر؛ تەرز ٥. چۆنیەتیِ بیچم و شکڵ ☰ ١تا٣. رنگ ۴. طور؛ طرز ۵. نمود

▣ **ڕەنگی سارد:** هەموو ڕەنگەکانی نێوان کەسک و بەنەوش ☰ رنگ سرد

**ڕەنگی سەرەکی:** سێ ڕەنگی سوور و زەرد و شین (ئاوی) کە لە تێکەڵ بوونیان، ڕەنگی سپی و هەموو ڕەنگەکانی‌تر درووست دەبن ☰ رنگ اصلی

**ڕەنگی گەرم:** هەموو ڕەنگەکانی نێوان زەرد و ئەرخەوانی ☰ رنگ گرم

**ڕەنگی مات:** هەموو ڕەنگێکی بێ بریقە ☰ رنگ مات

⊡ **ڕەنگ بزڕکان:** ڕەنگ پەڕین؛ ڕەنگ فڕین؛ ڕەنگ گۆڕین؛ ڕەنگ هەڵبزڕکان؛ ڕەنگ هەڵبڕسخان؛ زەرد بوون یان سپی ڕەنگ بوون لە ترسان یان لە نەخۆشی ☰ رنگ پریدن

**ڕەنگ پەڕین:** ☜ **ڕەنگ بزڕکان**

**ڕەنگ چوون:** ☜ **ڕەنگ ڕۆیشتن**

**ڕەنگ دانەوە:** ١. کاڵ بوونەوەی ڕەنگ بە هۆی شۆردن یان تاو لێ دان ٢. *[مەجاز]* کار تێکردن؛ کارکۆ بوون؛ شوێن دانان ٣. *[مەجاز]* دەنگ‌دانەوە ☰ ١. رنگ باختن ٢. تأثیر گذاشتن ٣. بازتاب یافتن

**ڕەنگ ڕژتن:** ☜ **ڕەنگ ڕشتن**

**ڕەنگ ڕشتن:** *[کینایە]* ڕەنگ ڕژتن؛ نیشانە کردنی جۆری خانووبەرە و بناخە دارشتنی ☰ طرح و شالودەی ساختمانی را ریختن

**ڕەنگ ڕۆیشتن:** ڕەنگ چوون؛ ڕەنگی خۆ لە دەست دان؛ پرووسقان؛ کاڵ بوونەوە؛ شەمزان ☰ رنگ باختن

**ڕەنگ فڕین:** ☜ **ڕەنگ بزڕکان**

**ڕەنگ کردن:** ڕەنگاندن؛ مەقلاندن: ١. ڕەنگ تێ‌ساوین ٢. بەن و قوماش دە خم نان ٣. *[مەجاز]* دەست بڕین و خاپاندن ☰ ١. رنگ کردن ٢. رنگرزی کردن ٣. کلاهبرداری کردن

**ڕەنگ گرتن:** ١. ڕەنگ پێوە نووسان ٢. *[کینایە]* شکڵ گرتن؛ بە شێوەی دڵخواز دەرهاتن؛ پێکهاتن ‹ماڵەکە نەختە ـ نەختە ڕەنگی گرت› ☰ ١. رنگی شدن ٢. شکل گرفتن

**ڕەنگ گۆڕین:** ١. گۆڕینی ڕەنگ ٢. خۆ گۆڕین؛ بە جۆرێکی تر خۆ نیشان دان ٣. ☜ **ڕەنگ بزڕکان** ☰ ١. عوض کردن رنگ ٢. رنگ عوض کردن ٣. ☜ **ڕەنگ بزڕکان**

**ڕەنگ هەڵبڕسخان:** ☜ **ڕەنگ بزڕکان**

**ڕەنگ هەڵبزڕکان:** ☜ **ڕەنگ بزڕکان**

**ڕەنگ هێنان و بردن:** *[کینایە]* ١. ترسان ٢. شڵەژان ‹پیرێژن کە دیتی مات بووم و ڕەنگێکم هێنا و برد، بێ‌هەست و چرپە لە دوکان دەرکەوت و وازی لە مزگێنی ساندن هێنا «هەژار، چێشتی مجێور»› ٣. شەرمەزار بوون ☰ ١. ترسیدن ٢. آشفتن ٣. شرمنده شدن

**• ڕەنگ[2]:** پاشەوشە. ـ ئاسا ‹زیندەڕەنگ› ☰ ـ سا

**ڕەنگئاچوخ / řeng'açux/:** ☜ **ڕەنگ‌قەکری**

**ڕەنگار / řengar/:** ئاوەڵناو. ڕەنگدار؛ پڕڕەنگ؛ تۆخ ☰ پُررنگ

**ڕەنگاڵ / řengał/:** ناو. ١. بزگوری دڕاوی داوێن ٢.

☜ ڕەواق ▆ ١. پارەی فروهشتە از دامن ٢. ☜ ڕەواق

**ڕەنگاڵە** / řengałe/: ☜ **ڕەنگڕێژە**

**ڕەنگامە** / řengame/: ئاوەڵناو. ڕەنگاوی؛ ئالایی؛ ئاڵوواڵا؛ ڕەنگاوڕەنگ ▆ رنگارنگ

**ڕەنگان** / řengan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //ڕەنگای؛ دەڕەنگێی؛ بڕەنگێ// ڕەنگ تێ‌هەڵسوان ▆ رنگ شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ڕەنگاو/ چاوگی نەرێنی: نەڕەنگان

**ڕەنگاندن** / řengandin/: چاوگ. تێپەڕ. //ڕەنگاندت؛ دەڕەنگێنی؛ بڕەنگێنە// ڕەنگانن؛ ڕەنگ لێ دان؛ ڕەنگ تێ‌هەڵسوون ▆ رنگ‌آمیزی کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـــ/ چاوگی نەرێنی: نەڕەنگاندن

**ڕەنگانن** / řenganin/: ☜ **ڕەنگاندن**

**ڕەنگاو** / řengaw/: ☜ **ڕنگاو**

**ڕەنگاوڕەنگ** / řengawřeng/: ☜ **ڕەنگامە**

**ڕەنگاوی** / řengawî/: ئاوەڵناو. ڕەنگ تێوەتلاو ▆ رنگی شده

**ڕەنگبزرکاو** / řengb(i)z(i)řkaw/: ئاوەڵناو. ڕەنگ پێوە نەماو؛ سپی یان زەردهەڵگەڕاو. هەروەها: **ڕەنگبزرکاوی** ▆ رنگ‌پریده

**ڕەنگبەر** / řengber/: ئاوەڵناو. ڕەنگ‌لابەر؛ ڕەنگ‌سڕ؛ بە تایبەتمەندی لابردنی ڕەنگ ‹ئاوئوکسیژنە ڕەنگبەرە› ▆ رنگ‌زُدا

**ڕەنگبەری** / řengberî/: ناو. ڕەنگ‌لابەری؛ کار و ڕەوتی ڕەنگ لێ‌کردنەوە ▆ رنگ‌زُدایی

**ڕەنگبەس** / řengbes/: ئاوەڵناو. خۆڕەنگ؛ بە ڕەنگی سروشتییەوە ▆ خودرنگ

**ڕەنگبەندی** / řengbendî/: ناو. چۆناوچۆنی وێک‌کەوتن و جێگر بوونی ڕەنگ لە ئاسەوارێکدا (وەک: وێنەکێشی، وێنەگری) یان لە کۆمەڵەیەکدا (وەک: جل‌وبەرگ و...) ▆ رنگ‌بندی

**ڕەنگپەڕی** / řengpeřî/: ☜ **ڕەنگپەڕیو**

**ڕەنگپەڕیگ** / řengpeřîg/: ☜ **ڕەنگپەڕیو**

**ڕەنگپەڕیو** / řengpeřîw/: ئاوەڵناو. ڕەنگ پەڕیگ؛ ڕەنگ‌پەڕی: ١. ڕەنگ‌بزرکاو ٢. ڕەنگ‌چوو؛ کاڵەوەبوو ▆ ١. رنگ‌پریده ٢. رنگباخته

**ڕەنگچوو** / řengçû/: ☜ **ڕەنگپەڕیو-٢**

**ڕەنگدار** / řengdar/: ☜ **ڕەنگار**

**ڕەنگدانە** / řengdane/: ناو. ماکی هۆی ڕەنگی بوونی هەر شتێک (وەک: کولوروفیل لە گیا و هیموگلۆبین لە خوێندا) ▆ رنگدانە

**ڕەنگڕژە** / řengř(i)je/: ☜ **ڕەنگڕێژە**

**ڕەنگڕەز** / řengřez/: ناو. ڕەنگڕێز؛ ڕەنگڕێژ؛ خمگەر؛ ئەوەی جلک و هەودا ڕەنگ دەکا ▆ رنگرز

**ڕەنگڕەزی** / řengřezî/: ناو. خومگەری ▆ رنگرزی

**ڕەنگڕەژە** / řengřeje/: ☜ **ڕەنگ‌ڕێژە**

**ڕەنگڕێز** / řengřêz/: ☜ **ڕەنگڕەز**

**ڕەنگڕێژ** / řengřêj/: ☜ **ڕەنگڕەز**

**ڕەنگڕێژە** / řengřêje/: ناو. ڕەنگاڵە؛ ڕەنگ‌ڕەژە؛ ڕەنگەڕێژە؛ کەندەسمە؛ مێش‌خۆرە؛ هەنگ‌چنە ▆ زنبورخوار

**ڕەنگڕێژی** / řengřêjî/: ناو. ١. خومگەری؛ ڕەنگڕێژی ٢. خومخانە؛ دووکانی خومگەری ٣. پیشەی ڕەنگڕێژی ▆ ١تا٣. رنگرزی

**ڕەنگسازی** / řengsazî/: ناو. ١. کار و ڕەوتی ڕەنگ دروست کردن ٢. شوێنی ڕەنگ چێ‌کرن ▆ ١و٢. رنگسازی

**ڕەنگسڕ** / řengsiř/: ☜ **ڕەنگبەر**

**ڕەنگڤەکری** / řengvek(i)rî/: ئاوەڵناو. ڕەنگ‌ئاچوخ ▆ رنگ‌روشن

**ڕەنگکار** / řengkar/: ناو. ڕەنگ‌کەر؛ کەسێ کە کاری ڕەنگ کردنە ▆ رنگ‌کار

**ڕەنگکاری / řengkarî/**: ناو. کاری داپۆشانی رووبەرێک بە ڕەنگ 🇮🇷 رنگ‌کاری؛ نقاشی

**ڕەنگکەر / řengker/**: ☜ ڕەنگکار

**ڕەنگلابەر / řenglaber/**: ☜ ڕەنگبەر

**ڕەنگلابەری / řenglaberî/**: ☜ ڕەنگبەری

**ڕەنگناسی / řengnasî/**: ناو. بەشێک لە زانستی ناسینی ڕەنگ کە لە تۆخی و کاڵی ڕەنگەکان دەکۆڵێتەوە 🇮🇷 رنگ‌شناسی

**ڕەنگوڕوو / řeng û řû/**: ناو. [کنایە] سیما؛ دیمەنی روخسار 🇮🇷 سیما

**ڕەنگوڕووما / řeng û řûma/**: ناو. ڕەنگوڕوو؛ دیمەنی روخسار ‹بۆ لچی وشک و بەبار و ڕەنگوڕوومای زەردتان/ دوور لە خۆی، بێ شوێنە مەجنوون چۆلە شاخ و هەردتان «قانع»› 🇮🇷 سیما

**ڕەنگوڕیس / řeng û řîs/**: ناو. بەنی ڕەنگاوڕەنگی تەون 🇮🇷 نخ الوان بافندگی

**ڕەنگە / řenge/**: ئاوەلکار. شایەتا؛ وێدەچێ؛ دەشێ؛ ئەشێ ‹لە شیرینی ئەتۆ، ئەی خوسرەوی تەختی زەمین! ڕەنگە/ بگاتە ئاسمانی بێستوون فەرهادی هاوارم «نالی»› 🇮🇷 شاید؛ ممکن است

**ڕەنگەرژیلە / řenger(i)jîle/**: ناو. گوڵێکی ڕەنگاوڕەنگە 🇮🇷 گلی رنگارنگ

**ڕەنگەڕێژە / řengeřêje/**: ☜ ڕەنگڕێژە

**ڕەنگهەڵگەڕاو / řenghełgeřaw/**: ئاوەڵناو. ڕەنگبزرکاو 🇮🇷 رنگ‌باخته

**ڕەنگی / řengî/**: ئاوەڵناو. ١. ڕەنگاوی؛ ڕەنگ وەخۆگرتوو ‹گنجەکەم ڕەنگی بوو› ٢. ڕەنگامە؛ ڕەنگین؛ بەلەک بردێن ‹سەرپۆشێکی ڕەنگامەی دابوو بە سەریدا› ٣. [چاپ] بە ڕەنگی‌تر، جگە یا زیاد لە ڕەش و سپی ‹وێنەی ڕەنگی› 🇮🇷 ١تا٣. رنگی

**ڕەنگین / řengîn/**: ئاوەڵناو. ١. ڕەنگاوڕەنگ ٢. ڕەنین؛ خوشیک؛ سپەهی؛ جوان‌چاک 🇮🇷 ١. رنگین ٢. زیبا

**ڕەنگین‌پێست / řengînpêst/**: ئاوەڵناو. ڕەگەزی بێجگە سپی پێست 🇮🇷 رنگین‌پوست

**ڕەنۆ / řeno/**: ☜ ڕندوو

**ڕەنوو / řenû/**: ☜ ڕندوو

**ڕەنوونە / řenûne/**: ناو. کەرکیت؛ هەپە؛ شانەی ئاسنی تەون کوتان 🇮🇷 شانەی پودکوبی در قالیبافی

**ڕەنە / řene/**: ☜ ڕەندە

**ڕەنەک / řenek/**: ناو. ڕنەک؛ بربەند؛ مەورە ‹چەنگ و نەی لێ مەدە موتریب کە لە بەر فیرقەتی ئەو/ ڕەنەکی ڕۆحە لە گوێم نەغمە و ئاوازی ڕەباب «شێخ ڕەزا»› 🇮🇷 سوهان

**ڕەنی / řenî/**: ☜ ڕندوو

**ڕەنین / řenîn/**: ئاوەڵناو. جوان؛ خوشیک؛ سپەهی 🇮🇷 زیبا

**ڕەنێو / řenêw/**: ناو. کاری پەروەرین؛ سەرپەرشتی کردن و پێ‌گەیاندن 🇮🇷 تربیت

⊡ **ڕەنێو هاتن**: پەروەردە بوون 🇮🇷 تربیت شدن

**ڕەنێو هێنان**: پەروەردە کردن؛ پێگەیاندن ‹ئەوی گەنمی ڕەنێو دێنا بە زەحمەت/ لە ماڵیدا نەبوو خۆی زمەهرێک جۆ «هێمن»› 🇮🇷 پرورش دادن

**ڕەنێوهاتوو / řenêwhatû/**: ئاوەڵناو. پەروەردەکراو؛ پێگەیەنراو 🇮🇷 تربیت‌شده

**ڕەو[1] / řew/**: ناو. ١. ڕەڤ؛ باز؛ کاری هەڵاتن ‹فیتنەیی غەمزە و نازی نیگەهە و چاوە کە وا/ هات و هاوار و هەرا و گێچەڵ و تالان و ڕەوە «حاجی قادر»› ٢. حەپە؛ وەڕە (سەگ) 🇮🇷 ١. فرار ٢. پارس (سگ)

⊡ **ڕەو کردن**: ١. ڕەڤین ٢. حەپە کردن 🇮🇷 ١. رمیدن ٢. پارس کردن

▪ **ڕەو[2]**: ☜ ـ ڕۆ[3]

**ڕەوا / řewa/**: ئاوەڵناو. ١. قەبووڵ؛ پەسندکراو ‹کەی لە کن ئەحمەق دەبێ حاجەتی دانا ڕەوا؟/ قەت دەکرێ چەرمەکەر یا بە عەبا یا کەوا؟

«مەحوی»› ٢. شیاو؛ ڕجوا؛ گونجاو لەگەڵ قانوون و داب و نەریتدا ‹کاری ڕەوا› ٣. بەجێ؛ لەجێ؛ هەڵێب ‹ڕەوا زانین› ☰ ١. پذیرفته ٢. شایسته ٣. روا

▣ **ڕەوا بوون:** باش بوون؛ شیاو بوون ‹ڕەوایە دایکت بڕەنجێنی؟› ☰ روا بودن

**ڕەوا دیتن:** ڕجوا دین؛ پەزێران ‹خۆشی بۆ خۆی ڕەوا دەبینێ، بۆ خەڵک نە!› ☰ روا شمردن

**ڕەوا کردن:** حەلاڵ کردن؛ ڕێگە پێدان بۆ جێبەجێ کردنی کارێک ‹ڕۆح و دڵ و دین هەر سێ دەکەم بەزل و نیساری/ کامی دڵی من گەر لە لەبی لەعلی ڕەوا کا «شێخ ڕەزا»› ☰ حلال کردن

(بە) **ڕەوا زانین:** ١. بە باش/ شیاو زانین ‹ئەم کارە بە ڕەوا نازانم› ٢. ڕەوا دیتن؛ دڵ پێڕازی بوون ‹هێندە لە خەمی خەڵکا بوو، حەسانەوەی بۆ خۆی بە ڕەوا نەدەزانی› ☰ ١. روا داشتن ٢. روا دیدن

**ڕەواج / řewac/:** ناو. ڕەمێن؛ برەو؛ پەرە ☰ رواج

**ڕەوارتن / řewartin/:** چاوگ. ١. بەتاڵ کردن ٢. تراشین؛ ڕەندە لێ دان ☰ ١. خالی کردن ٢. تراشیدن

**ڕەوارە / řeware/:** ☜ ڕەقاڵە

**ڕەواز / řewaz/:** ناو. ١. ڕاڕەو؛ ڕێباز؛ شوێنێ کە زۆرتر ڕێگەی هاتوچووی خەڵکە ٢. ڕێزەبەردی سەر ملەی کێو ☰ ١. رهگذر ٢. سنگلاخ قلەی کوه

**ڕەواسە / řewase/:** ☜ ڕێوی ـ١

**ڕەواق / řewaq/:** ناو. ڕەواقی؛ ڕەنگاڵ؛ ئەو شیرە تراوەی لە شانە هەنگوین هەڵدەچۆڕێ ☰ شهد

**ڕەواقی / řewaqî/:** ☜ ڕەواق

**ڕەواڵ[١] / řewał/:** ☜ ڕواڵ

**ڕەواڵ[٢]:** ئاوەڵناو. ١. هەژار؛ نەدار ٢. ☜ ڕواڵ ☰ ١. بینوا ٢. ☜ ڕواڵ

**ڕەوان[١] / řewan/:** ☜ ڕەڤان

**ڕەوان[٢]:** ناو. ١. گیان؛ جان؛ گێون؛ گان؛ سەرجەمی هێزی هەستی و جمشتی گیاندار ٢. دەروون؛ ڕۆح؛ هەوێن و هێمای ژوورەسروشتی، هەتاهەتایی و غەیرەماکی مرۆ کە بەپێی بیر و بڕوای ئایینی، پاش مەرگ لە لەش جیا دەبێتەوە ‹ئەم مەیسیفەتی خوونخورە وا نازک و سوورە/ یاقووتی لەبە، یا گوڵە؟ یا قووتی ڕەوانە؟ «مەحوی»› ☰ ١. جان ٢. روح

**ڕەوان[٣]:** ئاوەڵناو. ١. لەگەڕ؛ وەگەڕ؛ بە بێ گت کردن و هەر لە ڕۆیشتندا ‹قاسیدیچ واچوون پەی سەفەر خاسەن/ ڕەوان بۆ تێژڕەو هەرس و هەناسەن «مەولەوی»› ٢. لەبەر؛ هۆژاندی؛ تەواو فێر ‹وانەکەم ڕەوانە› ٣. تووشیاری نەخۆشی زکچوون ☰ ١. جاری؛ روان ٢. از بر ٣. اسهالی

▣ **ڕەوان بوون:** ١. لە بەر بوون ٢. بەڕێ بوون ٣. تووشی زگچوون بوون ☰ ١. از بر بودن ٢. روانە شدن ٣. اسهال گرفتن

**ڕەوان کردن:** ١. باش فێر بوون ٢. ناردن؛ هەناردن ٣. خوڕ کردن ☰ ١. خوب یاد گرفتن ٢. فرستادن ٣. جاری کردن

**ڕەوان[٤]:** ئاوەڵکار. بێ گت و گرێ ‹کتێبەکەم ڕەوان خوێندەوە› ☰ روان

**ڕەوانامە / řewaname/:** ناو. ڤیزا؛ ئیزنی چوون بۆ وڵاتێ ☰ روادید؛ ویزا

**ڕەوانبێژ / řewanbêj/:** ئاوەڵناو. دەمپاراو؛ قسەڕەوان ☰ خوش‌سخن

**ڕەوانبێژی / řewanbêjî/:** ناو. ١. دەمپاراوی؛ قسەڕەوانی ٢. زانستی لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی دەقی ئەدەبی، لە باری پاراوە بوون و ڕوون و جوان بوونەوە ☰ ١. شیرین‌سُخنی ٢. بلاغت

**ڕەواندژ / řewandij/:** ناو. تانک؛ مەترالێزە؛ مەترەلۆز؛ دەبابە ☰ تانک جنگی

**ڕەواندن / řewandin/:** ☜ ڕەڤاندن

**ڕەواندنەوە / řewand(i)newe/:** چاوگ. تیەڕ.

//ڕەواندتەوە؛ دەڕەوێنیەوە؛ بڕەوێنـەوە// ڕەواننـەوە: ١. ترساندن و بلاو پێکردنی حەیوان و هـەڵاتنی ٢. بەند لە پزوو دەرکێشان ٣. ڕاماڵ درانی هـەور بە هۆی با ٤. گوشاد کردنەوە ٥. لێک کردنەوەی شـتی تۆکمـە یـان چنـراو ‹بـە تـەور دارەکـەی ئەقلیشـاندەوە/ بـە پـواز لـە یـەکی ئەڕەوانـدەوە «پیرەمێرد»› ☰ ١. رماندن ٢. بند نیفه بـاز کـردن ٣. پراکندن ابر به وسیلەی باد ۴. گشاد کردن ۵. متـراکم را از باز کردن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: ـــ/ چـاوگی نـەرێنی: نەڕواندنەوە

**ڕەواندوو / řewandû/**: ناو. چەسپی پارچەیی بۆ نێو یەخە و سەردەستی کراس ☰ آهار پارچەای

**ڕەوانساز / řewansaz/**: نـاو. ماکـێ کـە بـۆ کـەم کردنەوەی تێک‌گیرانی بەشە جوولەوەرەکانی نێو ماشین بە کار دێ (وەک: ڕۆن و گریس) ☰ روانساز

**ڕەوانشـاد / řewanşad/**: ئاوەڵـناو. مـــەرحووم؛ ڕەحمەتی؛ خوا لێ‌خۆش‌بوو ☰ روانشاد

**ڕەوانکۆڵی / řewankołî/**: ☜ **دەروون‌کۆڵی**

**ڕەوانن / řewanin/**: ☜ **ڕەڤاندن**

**ڕەوان‌ناس / řewannas/**: ناو. دەروون‌ناس؛ کەسـێ کە خاوەن زانست و ئەزموونی دەروون‌ناسـییە ☰ روان‌شناس

**ڕەوان‌ناسی / řewannasî/**: نـاو. دەروون‌ناســیی؛ زانستیی لێکۆڵـینەوەی دیـاردە و کارکردەکـانی دەروونی (وەک: هـزر، بـیر، هەسـت، تێگەیشـتن، تێفکرین، ئاکار) و شێوەی ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئاڵۆز بوونیاندا ☰ روان‌شناسی

**ڕەوان‌نوس / řewannûs/**: نـاو. چەشـنێ قەڵـەمی نووک‌ساچمەیی کە جێ جەوهەرەکەی هـەر لـە کارخانەدا پڕ کـراوە و تـەڕ و ڕەوان دەنووسـێ ☰ روان‌نویس

**ڕەواننەوە / řewannewe/**: ☜ **ڕەواندنەوە**

**ڕەوانە[1] / řewane/**: نـاو. ڕوانـە؛ بەدرەقـە؛ کـاری بـەڕێ کـردنی کەسـێ کـە دەڕوا، بـە نیشـانەی میهرەبانی و ئەدەب ☰ بدرقە

**ڕەوانە[2]**: ئاوەڵناو. ڕوانە؛ ڕوونیا؛ بەڕێ؛ وێکەوتوو؛ لـە چووندا؛ خەریکی چوون بۆ شوێنێک ☰ روانە

▣ **ڕەوانە بوون**: بەڕێ بوون؛ کەوتنە ڕێ ‹هەر ڕۆژە ڕەوانەی شوێنێک دەبووم› ☰ روانە بودن

**ڕەوانە کران**: بـەڕێ کـران؛ نێـردران ‹هـەر ڕۆژە ڕەوانەی شوێنێک دەکرام› ☰ روانە شدن

**ڕەوانە کردن**: ١. بەڕێ کردن؛ ناردن؛ کیاسـتەی ‹ئەمڕۆ سێ هەزار حاجییان ڕەوانە کرد› ٢. بەڕێ کردن؛ بەدرەقە کردن ‹میوانەکانم ڕەوانـە کـرد› ٣. دەگەڵ کەسێ چوون بۆ بەرگری کردن لـە مەترسی، وەکوو هێرشـی سـەگ و ... ‹دا لـەو سەگانەم ڕەوانـە کـە!› ☰ ١. فرسـتادن ٢. بدرقـە کردن ٣. همراهی کردن برای جلوگیری از خطر

**ڕەوانـەکـراو / řewanek(i)raw/**: نـاو. شـــاندی؛ ناردراو؛ هەناردوو ☰ فرستادە شدە

**ڕەوانەوە / řewanewe/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //ڕەوایـەوە؛ دەڕەوێیەوە؛ بڕەوێوە// ڕەمایۆ: ١. کرانەوەی بەندی پزوو ٢. نەمانی تـەم و هـەور بـە هـۆی بـاوە ‹بـا هەڵیکرد و هەورەکانی ڕەواندەوە› ☰ ١. باز شدن بند نیفە ٢. پرکندە شدن ابرها و صاف و آفتابی شدن هوا

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: ڕەواوەوە/ چـاوگی نـەرێنی: نەڕەوانەوە

**ڕەوانی[1] / řewanî/**: نـاو. ١. دۆخـی زگچـوون ٢. عورووسـی؛ پەنجـەرەی کـە هەڵـدەدرێتەوە ٣. دیرەکی مـیچ ٤. شـل و تـراوی ☰ ١. اسـهال ٢. پنجرەی اُرُسی ٣. بالار ۴. روانی

**ڕەوانی[2]**: ئاوەڵناو. ١. تووشیاری نەخۆشی ڕەوان ٢. پێوەندیدار بە ڕەوانەوە ☰ ١و٢. روانی

**ڕەوایی / řewayî/**: ناو. بافت؛ شیاوی ☰ شایستگی

**ڕەوت / řewt/**: نـاو. ڕەوتانـە؛ گەڕانـە: ١. زنجـیرە

چالاکی، کردەوە یان گۆڕانکاری بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی دیاریکراو ‹ڕەوتی بەرهەم هێنانی بەنزین› ٢. شێوەی بە ڕێدا چوون ٣. کێشی شیعر ٤. ڕەفتار؛ ئاکار؛ مەش؛ هەڵس‌وکەوت ٥. لەنجە؛ لەنجەولار؛ ڕۆیشتنی بە ناز ‹عەسا و قامەتم تیر و کەوانە/ کەچی دڵ تالیبی ڕەوتی کەوانە «حاجی قادر»› ٦. ڕەفت؛ جۆرێ ڕێ چوونی چوارپێی سواری بەتایبەت ئەسپ کە هێورترە ‹قانعا ئەم ئەسپە چاکە بێنە مەیدانی گرەو/ گاهێ ڕەوت و گاهێ وێرغە گاهێ نەرمە، گاهێ غار «قانع»› ٧. بزاڤ؛ جەرەیان ‹ڕەوتی سەلەفیزم؛ ڕەوتی سەدر› ☰ ١. فرایند ٢. شیوەی راه رفتن ٣. وزن شعر ۴. رفتار ۵. خرام ۶ رفت؛ نوعی راه رفتن مرکب ٧. جریان

◘ **ڕەوت کردن:** بە لەنجە و لار ڕێ کردن ‹هەروا دەڕوا دەکا ڕەوتێ/ وەکوو کۆتری بەرمزگەوتێ/ سووتام بڕژام کۆسم کەوتێ «فولکلۆر»› ☰ خرامیدن

**ڕەوتاندن** / řewtandin/: چاوگ. تۆقاندن؛ زۆر ترساندن ☰ هراساندن

**ڕەوتانە** / řewtane/: ☜ ڕەوت

**ڕەوتن** / řewtin/: چاوگ. وەرینی خونچە یان گەڵای دار ☰ ریختن غنچە یا برگ درخت

**ڕەوتوو** / řewtû/: ئاوەڵناو. تاراو؛ هەراسان ‹یەکێ دوور و یەک نزیک، یەکێ نزم و یەک بڵندە/ هەموو کەوتوو، ڕەوتوو، سەرسام، وەکوو لەشکری شکەستە «ئاوات»› ☰ هراسیدە

**ڕەوتەنی** / řewtenî/: ☜ ڕەفتەنی

**ڕەوتین** / řewtîn/: چاوگ. گوڵ و گەڵاڕێزان کردن؛ داوەرینی گوڵ و گەڵا ☰ برگ و گُل ریختن

**ڕەودەک** / řewdek/: ناو. کەچکەقوڵە؛ گەرای بۆق ☰ تخم قورباغە

**ڕەو ـ ڕەو** / řew řew/: دەنگەناو. حەپەحەپ (گەماڵ) ☰ حپ ـ حپ (سگ)

**ڕەوڕەوک** / řewřewik/: ناو. تراویلکە؛ بەردەترۆق؛ بەردەتراویلکە؛ دیاردەیەکی کەشی بە هۆی تیشکدانەوەی نوور لە سەر تویژێکی هەوای گەرمدا، کە دیمەنێکی وەک ئاو بەدی‌دێنێ ☰ سراب

**ڕەوڕەوە** / řewřewe/: ناو. ١. ئامرازێکی پێچکدار کە مناڵ پێی فێرە ڕۆیشتن دەبێ ٢. ڕاوڕاوێلکە؛ ڕەوڕەویلکە؛ تۆرەمە باڵندەیەکن لە تەنکاوان دەژین، دندووکیان تیژە، تونـد دەفڕن، پیرۆن، کاتی چینە سەر و کلکیان لە سەر یەک دەجووڵێنن، زۆربەیان کۆچەرن و بە پۆل دەفڕن، لە سەر زەوی ڕووتەن هێلانە دەکەن، دانەوێڵە و گیانەوەری ورد دەخۆن، پتر لە ١٦ جۆریان ناسراوە بۆ وێنە: بەردگێڕە؛ دەیدومەک؛ زیڕە؛ زیقاوە و... ☰ ١. روروک ٢. سلیم؛ مُرغ باران

**ڕەوڕەویلکە** / řewřewîlke/: ☜ ڕەوڕەوە ـ٢

**ڕەوزە** / řewze/: ناو. *[شێعە]* ١. بەسەرهاتی پیاوانی ئایینی و ئیمامان کە جاروبار بە هۆنراوە و لاواندنەوەوە دەگوترێ و بیسەرانی پێ دەگرین ٢. کۆڕی خوێندنەوەی ئاوا بەسەرهاتێک ‹وەک ڕووژ عاشوورا سینە و ڕەوزەمە/ لە دووری باڵات سەوزە ـ سەوزەمە «فولکلۆر»› ☰ ١و٢. روضە

**ڕەوس** / řews/: ناو. کلۆشی بەر پێ لە خۆیاندا ☰ ساقەی در حال کوبیدن در خرمن

**ڕەوسە**[1] / řewse/: ناو. خۆیانی گێرەکراوی هێشتا کۆوەنەکراو ☰ خرمن کوبیدەی تودە نشدە

**ڕەوسە**[2]: ئاوەڵناو. سوورباو؛ ڕەنگ‌سوور ☰ سُرخ‌رنگ

**ڕەوش** / řewş/: ناو. ١. جوانی و گەشایی کوڵمە ٢. خشڵ و زەنبەر ٣. پەسن و تاریف ☰ ١. زیبایی گونە ٢. زیور ٣. ستایش

**ڕەوش** / řewiş/: ناو. ئەخلاق؛ خولق و خۆ ☰ مشی

**ڕەوشاندن** / řewşandin/: چاوگ. ڕووناکی دان ≡ روشنایی بخشیدن

**ڕەوشباش** / řewişbaş/: ئاوەڵناو. قامخۆش؛ ئاکارپەسند ≡ بااخلاق

**ڕەوشت** / řewişt/: ناو. ڕەفشت؛ ئاکار ≡ منش

**ڕەوشتجوان** / řewiştc(i)wan/: ئاوەڵناو. بەئاکار ≡ خوش‌اخلاق

**ڕەوشتخراپ** / řewiştx(i)rap/: ئاوەڵناو. نخای؛ بەدڕست ≡ بی‌ادب

**ڕەوشەن** / řewşen/: ئاوەڵناو. ڕۆشن؛ ڕووناک ≡ روشن

**ڕەوق** / řewiq/: ناو. ڕەوەق؛ بارست؛ ئەستوورایی؛ کۆتەرە ≡ ضخامت؛ ستبری

**ڕەوک¹** / řewk/: ☜ **ڕەوکە**

**ڕەوک²**: ئاوەڵناو. سڵ؛ سرک؛ ڕەفۆک ≡ رموک

**ڕەوکە** / řewke/: ناو. ڕەوگ؛ ڕەوک؛ ڕەوگە؛ ڕەوە؛ ڕەووو؛ کۆمەڵە ئەسپ و ماینی بەرەڵداکراو بۆ لەوەڕ ≡ رمەی اسب یله در چراگاه

**ڕەوکەوان** / řewkewan/: ناو. ڕۆکەوان؛ ڕەوگەوان؛ ڕەوەوان؛ ئاگاداری ڕەوکە. هەروەها: **ڕەوکەوانی** ≡ نگهبان رمەی اسب

**ڕەوگ** / řewig/: ☜ **ڕەوکە**

**ڕەوگە** / řewge/: ناو. ١. شوێنێ کە ئاوارەی وڵات خۆی لێ دەگرنەوە ٢. ☜ **ڕەوکە** ≡ ١. تبعیدگاه ٢. ☜ **ڕەوکە**

**ڕەوگەوان** / řewgewan/: ☜ **ڕەوکەوان**

**ڕەونج** / řewinc/: ناو. ڕەقیتە؛ ڕەوتی لەش ڕەق بوون لە سەرما ≡ حالت سفت شدن بدن از شدت سرما

⊡ **ڕەونج کردن**: ڕەق بوونی لەش لە سەرما ‹یەکجار سەرمامە، وەختە ڕەونج بکەم› ≡ سفت شدن بدن از شدت سرما

**ڕەوندە** / řewinde/: ناو. ئەوەی بە ڕێدا دەڕوا ≡ رونده؛ رهرو

**ڕەونەق** / řewneq/: ناو. باو؛ برەو ≡ رونق

**ڕەووو** / řewû/: ☜ **ڕەوکە**

**ڕەوە¹** / řewe/: ناو. ١. ☜ **ڕەوکە** ٢. داری چەند لق کە گەزۆی پێ دەوەرێنن ≡ ١. ☜ **ڕەوکە** ٢. چوبِ گزانگبین تکاندن

**ڕەوە²**: دەنگەناو. وەڕە؛ حەپە (سەگ) ≡ عوعو (سگ)

**ڕەوەبەراز** / řeweberaz/: ناو. لۆدە؛ ڕانەبەراز ≡ رمەی خوک

**ڕەوەت** / řewet/: ناو. ١. ☜ **ڕەبەت** ٢. خۆشی و شادی ٣. ڕم؛ داری درێژی گوێز تەکاندن ≡ ١. ☜ **ڕەبەت** ٢. شادی ٣. چوب بلند گردو تکاندن

**ڕەوەدە** / řewede/: ناو. وڕەو؛ گەلەی بەراز و گورگ ≡ گلەی گُرگ و گُراز

**ڕەوەز** / řewez/: ناو. چین‌چینەی بەردی ناو قەد و سەری کێو ≡ چینه‌های سنگی کوه

**ڕەوەق** / řeweq/: ☜ **ڕەوق**

**ڕەوەک** / řewek/: ئاوەڵناو. ڕەمۆک: ١. ڕەوک؛ سرک؛ تۆڕ؛ قوشقی ‹نازەنینی شۆخ و شەنگی چاوبەڵەک/ ئاسکی دڵناسکی سرک و ڕەوەک «هێمن»› ٢. تایبەتمەندی ئاژەڵێ کە بێ شوان دەلەوەڕێ ≡ ١. رموک ٢. ویژگی حیوانی کە بی چوپان در چراگاه می‌چرد

**ڕەوەکی¹** / řewekî/: ناو. ١. ☜ **ڕەمەکی¹** ٢. ئاژەڵی بێ شوان ≡ ١. ☜ **ڕەمەکی¹** ٢. حیوان بی چوپان

**ڕەوەکی²**: ☜ **ڕەمەکی²**

**ڕەوەکیەتی** / řewek(i)yetî/: ناو. سڵی؛ سڵی ≡ رمیدگی

**ڕەوەن** / řewen/: ناو. ١. ☜ **ڕەوەند** ٢. ڕەوەندە؛ ڕێبوار ≡ ١. ☜ **ڕەوەند** ٢. رهرو

**ڕەوەنج** / řewenc/: ناو. سماقە؛ ڕەقیتە؛ نەخۆشی

لەش ڕەق بوونی ئاژەڵ لە سەرماوە ☰ سرمازدگی دام

**ڕەوەند / řewend/**: ناو. ڕەوەن؛ کۆچەر؛ ئەوانەی گەرمێن و کوێستان دەکەن ‹لەگەڵ هاتنی وەرزی گەرما، خێڵ و کۆچی ڕەوەند بەرەو هەوارەکان دەستی پێکرد› ☰ کوچرو؛ کوچنشین

**ڕەوەندە / řewende/**: ☜ ڕەوەن ـ٢

**ڕەوەندی / řewendî/**: ئاوەڵناو. خێڵەکی؛ عێلاتی؛ عەشایری ☰ عشایری

**ڕەوەوان / řewewan/**: ☜ ڕەوکەوان

**ڕەویان / řewyan/**: ☜ ڕەوین

**ڕەویانەوە / řewyanewe/**: ☜ ڕەوینەوە

**ڕەویتانگ / řewîtanig/**: ناو. ١. هێلانەی تازە ٢. [کینایە] خانووی تازە دروستکراو ☰ ١. لانەی تازە ٢. خانەی نوساز

**ڕەویتن / řewîtin/**: چاوگ. تاشین؛ داتاشین ☰ تراشیدن

**ڕەویتی / řewîtî/**: ئاوەڵناو. تاشراو؛ تاشیاگ ☰ تراشیده شده

**ڕەویرتن / řewîrtin/**: چاوگ. تاشین (بەرد) ☰ تراشیدن (سنگ)

**ڕەوین / řewîn/**: چاوگ. ڕەویان: ١. هەڵاتن لە ترسان ٢. ڕەین؛ حەپە کردن ٣. خەو زڕان؛ نەمانی خەو ٤. ڕەوینەوە؛ لاچوون ‹تەم لە سەران نەدەڕەوی و باران هەڵی نەدەبرینگاند «هێمن»› ☰ ١. رمیدن ٢. پارس کردن ٣. خواب از سر پریدن ۴. زایل شدن

**ڕەوینەوە / řewînewe/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //ڕەویتەوە؛ دەڕەویەوە؛ بڕەوێوە// ڕەویانەوە: ١. هەڵاتن؛ ڕەوین ٢. کرانەوە و لێک بوونەوە (وەک: پڕزووی شواڵ و...) ٣. ڕاست بوونەوەی گەو ‹سەری گۆچانەکەم ڕەویوەتەوە› ٤. بڵاوە کردن (وەک: لێکبڕانی هەوران) ٥. نەچوونەوە سەر دەقی پێشوو (وەک: بۆ کێش) ٦. هەڵمسان و ئەستوور بوونی لەڕادەبەدەر ☰ ١. رمیدن؛ دررفتن ٢. از هم باز شدن ٣. راست شدن کجی و حلقه ۴. پراکندن ۵. وارفتن ۶ آماسیدن از چاقی مُفرط

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ڕەویوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەڕەوینەوە

**ڕەویو / řewîw/**: ئاوەڵناو. هەتلە؛ هەترە؛ هەڵوەدا ☰ رمیده

**ڕەوێژە / řewêje/**: ناو. ڕەوێژەک؛ تیخی کەوچک کۆڵین ☰ تیغ مخصوص تراشیدن قاشق

**ڕەوێژەک / řewêjek/**: ☜ ڕەوێژە

**ڕەوێشتن / řewêştin/**: چاوگ. لە بەرد هەڵکەندن ☰ از سنگ تراشیدن

**ڕەوێلە / řewêle/**: ناو. گەلە؛ ڕێچکە؛ جەلە؛ ڕیز؛ قەتارە (زۆرتر بۆ گیانەوەران) ☰ صف؛ ستون

• **ڕەوێن / -řewên/**: پاشەوشە. ــ سڕێن؛ قەسڕێن؛ لابەر ‹خەمڕەوێنێک لێرە من ناکەم بەدی/ چۆن پەنا بۆ مەی نەبەم ساقی ئەدی؟! «هێمن»› ☰ رهاننده؛ زُداینده

**ڕەوێنراو / řewênraw/**: ئاوەڵناو. هەڵگیراو؛ هەڵگیریاگ ☰ ربوده شده

**ڕەوێنەر / řewêner/**: ئاوەڵناو. لابەر؛ دوورەوەکەر ☰ زُداینده

**ڕەه[1] / řeh/**: ناو. ١. ڕەگ ٢. ڕیشە ☰ ١. رگ ٢. ریشه

▣ **ڕەها سپی**: سپیڕەگ؛ ڕەگی لەنفی کە تراوی لەنفی تێدا دەگەڕێ ☰ رگ لنفی

**ڕەهێ خوێن**: ڕەگی خوێنبەر ☰ شریان

⊡ **ڕەه گرتن**: ڕەگ داکوتان ☰ ریشه دوانیدن

**ڕەه[2]**: ئاوەڵکار. ڕێک؛ ڕاست و بێ لاری ☰ راست

**ڕەها / řeha/**: ئاوەڵناو. ١. دەرباز؛ خەلسیو ٢. بەرەڵدا؛ بەرەڵا؛ وێڵ؛ بێ چاودێر ☰ ١و ٢. رها

⊡ **ڕەها کردن**: ١. بەرەڵدا کردن ٢. کردنەوەی

گرێ ☰ ١. رها کردن ٢. باز کردن گره

**ڕەھازەر** / řehazer/: ناو. زەردەچێوە؛ زەردەچـۆ ☰ زردچوبه

**ڕەھـال** / řehal/: نـاو. ڕەھێـل؛ پێتـەک؛ بـاوانی؛ جیازی بووک بۆ ماڵی زاوا ☰ جهیزیه

**ڕەھاندن** / řehandin/: چاوگ. دەست یـان کلـک ڕاوەشاندن ☰ دست یا دُم را تکان دادن

**ڕەھایی** / řehayî/: ناو. ڕزگاری؛ نەجات ‹جـە دەس بێگانان یاوون ڕەھایی/ مەس بـوون وە شـنۆی مـەی ئاشنایی «مەولەوی»› ☰ رهایی

**ڕەھبەر** / řehber/: ☜ ڕابەر

**ڕەھچک** / řehçik/: نـاو. وردەڕەگـی نێـوان ڕەگـە خوێنبەر و خوێن‌هێنەکانی لەش کە هەموو لەش دەتەنێتەوە ☰ مویرگ

**ڕەھستن** / řehistin/: چـاوگ. ڕوان و شین بوون ☰ روییدن

**ڕەھستی** / řehistî/: ئاوەڵناو. ڕواو؛ شین‌بوو ☰ روییده

**ڕەھن** / řeh(i)n/: نـاو. ١. بیبیلـەی چـاو ٢. کـار و دۆخی بارمتە دانان بۆ قەرز یا کـرێ کـردن ☰ ١. مردُمک چشم ٢. رهن

**ڕەھندە** / řehinde/: ئاوەڵناو. ڕەهەندە؛ ڕەهەننە: ١. عـەوداڵ؛ مـاڵ‌بەکۆڵـەوە؛ ئـاوارەی چۆڵـگەڕ ٢. گوشاد؛ فرت ٣. [پلار] پان و پۆڕ ‹کابرای ڕەهندەی ناقۆلا جێگای سێ کەسی گرتووە!› ☰ ١. خانه‌بدوش ٢. گُشاد ٣. گُنده‌بک

**ڕەھنک** / řehnik/: نـاو. ڕەهـن؛ بیبیلـەی چـاو ☰ مردُمک چشم

**ڕەھوال** / řehwal/: ئاوەڵناو. ڕەهوان؛ خۆشڕۆ؛ ڕەوان ☰ رهوار

**ڕەھوان** / řehwan/: ☜ ڕەهوال

**ڕەھۆڵ** / řehoł/: ناو. زاخوڕ؛ قەڵش یان چاکـێ لـە شتێکدا کە تا ناوەوە درێژەی هەیە ☰ شکاف ژرف

**ڕەھەستن** / řehestin/: چـاوگ. شـەڕ فرۆشـتن ☰ ستیزه‌جویی کردن

**ڕەھەل** / řehel/: ناو. باوانی؛ پێتەک ☰ جهاز عروس

**ڕەھەن** / řehen/: ☜ ڕەهەند ـ٢

**ڕەھەند** / řehend/: نـاو. ١. خەرەنـد؛ خەنـدەک؛ کەنەک؛ خەنەق ٢. ڕەهەن؛ ئاوەڕۆی ئاوی پـیس ٣. نەغم؛ ڕێگە بە ژێر زەویدا ٤. لا؛ ئـالی؛ ڕوخ ☰ ١. خندق ٢. مجرای فاضلاب ٣. نقب؛ تونـل ۴. سـو؛ طرف

**ڕەھەندە** / řehende/: ☜ ڕەهندە

**ڕەھەننە** / řehenne/: ☜ ڕەهندە

**ڕەھێش** / řehêş/: ناو. سیاتیک: ١. دەماری هەست و جوولەی پـێ ٢. نەخۆشـییەکی گرانـە کـە بـە هۆی هەو کردن یان قرنجانی دەماری ڕەهێشەوە بەدی دێ و پتر لە پشتێنەوە بۆ پشت ڕان و ئەژنۆ چڵ دەوشـێنێ ☰ ١. عصـب سـیاتیک ٢. بیمـاری سیاتیک

**ڕەھێشتە** / řehêşte/: نـاو. نـەجیب‌زادە؛ هـیلاد؛ خانەدان ☰ نجیب‌زاده

**ڕەھێڤ** / řehêv/: ناو. ماڵە؛ پەڵـەی دەم و چـاوی ژنی زکپڕ ☰ ماله؛ لکه‌ی صورت زن حامله

**ڕەھێـل** / řehêl/: نـاو. ڕەهـال؛ بـاوانی؛ پێتـەک؛ جیازی بووک ☰ جهیزیه

**ڕەھێڵ**[1] / řehêł/: ناو. ڕەهێڵە؛ ڕەژنە؛ ڕێژنـە؛ تـاوی باران ☰ رگبار باران

**ڕەھێڵ**[2]: ئاوەڵناو. تخێل؛ پانەوە بوو ☰ ولو

**ڕەھێڵە** / řehêłe/: نـاو. ڕەهـێڵ؛ تـاوی بـاران ‹ڕۆژ نەبوو چەند ڕەهێڵەی توند نەهێنێ و شەو نەبوو چەند ڕێژنەی بە خوڕەم نەبارێ «هێمن»› ☰ رگبار

**ڕەی** / řey/: نـاو. ١. مەی؛ پیت؛ پیتە؛ کـێش؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی زۆر کردنی بارستایی شـتێک ٢. یەکەی کێشی خۆماڵی بەرامبەر بە ١٢ کیلۆگرەم ☰ ١و٢. ری

⊡ **ڕەی کردن**: پیت دانەوە؛ زیاد کردن ‹برینجێکـی

باشە، یەک و دوو ڕەی دەکا› ☰ ری کردن

**ڕەیاکاروان / řeyakarwan/:** ناو. کادز؛ کاکێشان؛ گەلەستێر ☰ کهکشان

**ڕەیل / řeyl/:** ناو. ١. سەچە؛ پێکهاتەیەک لە ڕاهێلی پۆلایی بە شێوەی ⊥ کە لە هەر دوولای ڕێئاسندا، لە سەر تراوێرس دادەنرێن و چەرخی قەتار بە سەریاندا دەڕوا ٢. میلەیەکی پتر کانزایی و لێوارەدار کە ئامێرێک بە چەرخی گنجرەوە بە سەریدا دەڕوا ٣. پێکهاتەیەکی گنجر-گنجر کە ئامێرێکی تێدا یان بە سەردا دەخلیسکێ ☰ ١تا٣. ریل

**ڕەین / řeyn/:** ☜ **ڕەوین-٢**

**ڕەیین / řeyîn/:** ☜ **وەرین**[1]

**ڕه / řih/:** ناو. ١. ڕدێن؛ ڕندێن؛ ئەردێن؛ ڕیش ٢. ڕەھ ؛ ڕەگ؛ ڕیتگە؛ ڕەی ٣. ڕەھ ؛ ڕیشە؛ ڕیشگ؛ پنج ☰ ١. ریش ٢. رگ ٣. ریشه

**ڕهتن / řihtin/:** چاوگ. ڕژاندن ☰ ریختن

**ڕهنک / řihnik/:** ☜ **ڕووناکی**

**ڕهە / ř(i)he/:** ☜ **ڕیش -١**

**ڕی / řî/:** ناو. ١. چەروچاو؛ دیم؛ ڕوخسار ٢. ☜ **ڕیش -١** ☰ ١. صورت؛ چهره ٢. ☜ **ڕیش -١**

**ڕیئالیسم / řî'alîsm/:** ☜ **ڕاستیوازی**

**ڕیا / ř(i)ya/:** ناو. دووڕوویی؛ ڕووبینی ☰ ریا

**ڕیاباز / ř(i)yabaz/:** ئاوەڵناو. ڕیاکار؛ دووڕوو؛ ڕیاییکەر؛ ڕووبین ☰ ریاکار

**ڕیابازی / ř(i)yabazî/:** ناو. ڕیاکاری؛ دووڕووی؛ ڕووبینی ☰ ریاکاری

**ڕیازی / ř(i)yazî/:** ناو. بیرکاری؛ ڕیازیات ☰ ریاضی

**ڕیازیات / ř(i)yazyat/:** ☜ **ڕیازی**

**ڕیازیدان / ř(i)yazîdan/:** ناو. بیرکار؛ پسپۆڕ یان زانستمەندی ڕیازی ☰ ریاضیدان

**ڕیاکار / ř(i)yakar/:** ☜ **ڕیاباز**

**ڕیاکاری / ř(i)yakarî/:** ☜ **ڕیابازی**

**ڕیاڵ / ř(i)yał/:** ناو. ١. قران؛ قەران؛ دوو پەنابات؛ بیست شایی؛ یەکەی پارەی ولاتی ئێران ٢. یەکەی پووڵی سعوودی و چەند ولاتیتر ٣. ☜ **ڕنگ**[1] ☰ ١و ٢. ریال ٣. ☜ **ڕنگ**[1]

**ڕیاڵیست / ř(i)yałîst/:** ئاوەڵناو. لە سەر ڕێبازی ڕیئالیسم ☰ رآلیست

**ڕیاڵیسم / ř(i)yałîsm/:** ناو. ١. ئۆگرەتی و ئاوڕ دانەوە لە هەڵکەوتە و کار و باری گونجاو و بە دوور لە خەیاڵپەروەری ٢. ئامۆژەیەک کە جیهان بە هەڵکەوتەیێکی دەر لە زەینی مرۆ دەزانێ ٣. بڕوا بەوەی کە هەرچی بە هۆی بیر و هزرەوە دەناسرێت، خاوەنی هەبوونێکە لە جیهاندا ☰ ١تا٣. رآلیسم

**ڕیان**[1] **/ ř(i)yan/:** چاوگ. تێنەپەڕ. //ڕیای؛ دەڕیێ؛ بڕێ// ڕین؛ ڕیتن؛ گوو کردن ☰ ریدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ڕیاو/ چاوگی نەرێنی: نەڕیان

**ڕیان**[2]**:** ناو. ١. ڕان؛ مێگەلە مەڕ؛ کۆمەڵی مەڕ و بزن ٢. ڕێحانە؛ گیایەکی بۆنخۆشە ☰ ١. گلەی گوسفند و بُز ٢. ریحان

**ڕیای / ř(i)yay/:** چاوگ. ڕزگار بوون ☰ رها شدن

**ڕیایی / ř(i)yayî/:** ناو. مەرایی؛ دووڕوویی ☰ تزویر

⊡ **ڕیایی کردن:** مەرایی کردن ☰ تملق کردن

**ڕیاییکەر / ř(i)yayîker/:** ☜ **ڕیاباز**

**ڕیبا / řîba/:** ناو. سەڵەف؛ سووی پارە ☰ ربا

**ڕیپ / řîp/:** ناو. ١. تل؛ ڕەت ٢. تەڵەکە؛ گزی؛ فێڵ ☰ ١. تلو ٢. حیله

⊡ **ڕیپ پێدان:** *[کینایە]* عەزیەت دان؛ تووشی زەحمەت کردن ☰ توی زحمت و دردسر انداختن

**ڕیپ لێدان:** ١. گت کردن؛ تەکان دانی موتۆر ٢. *[مەجاز]* زمان هەڵە کردن و جوان قسە دەرنەهاتن ☰ ١و٢. ریپ زدن

**ڕیپاڵ**[1] **/ řîpał/:** ناو. ڕیپۆڵ؛ ڕیتاڵ؛ جلکی شڕ و دڕاو ☰ لباس ژنده

**ڕیپاڵ**[٢]: ناوەڵناو. ١. جلکشڕ؛ شڕەپۆش ٢. شـپرز؛ هەر شتێ لە شوێنێ ☰ ١. ژندەپوش ٢. نامُرتب

**ڕیپان / r̄îpan/**: نـاو. چـاوەنۆڕی؛ چـاوەڕوانی؛ چەمەڕایی ☰ انتظار

**ڕیپۆ / r̄îpo/**: ناوەڵـناو. ڕیپۆکـار؛ تەڵـەکەباز ☰ کلاهبردار

**ڕیپۆق / r̄îpoq/**: ناو. گوژاو؛ ڕچقاوە؛ ژەک؛ کلمش؛ قلیچ؛ پێخ؛ شـەلق؛ لـەچ؛ ڕیخنـە؛ ڕیـق؛ کیلـک؛ تراوی خەستی زەرد کە برێ جار بە هۆی چلـک کردنی چاو لە سـیلەی چـاودا کـۆ دەبێتـەوە ☰ ژفک؛ قی چشم

**ڕیپۆکار / r̄îpokar/**: ☜ ڕیپۆ

**ڕیپۆڵ**[١] **/ r̄îpoł/**: ☜ ڕیپاڵ[١]

**ڕیپۆڵ**[٢]: ناوەڵناو. *[پلار]* بێکار و لات ☰ ولگرد

**ڕیت**[١] **/ r̄ît/**: نـاو. ١. بـیچم و تـەرح ٢. تـەکان؛ بـزووتنی لەپـڕ ٣. پارچـەی دڕاو ☰ ١. ریخـت ٢. تکان ٣. کهنەی پارە ـ پارە

**ڕیت**[٢]: ☜ ڕووت

**ڕیتاڵ**[١] **/ r̄îtał/**: نـاو. ١. ☜ ڕیپـاڵ[١] ٢. زەمـینی کڕاڵ و بێ‌گیا ٣. پەرژین؛ چیـل ٤. ڕیتالـە؛ ڕەم؛ ڕیخ؛ شیاکە؛ گووگـای تـەڕ ☰ ١. ☜ ڕیپـاڵ[١] ٢. زمین بی‌گیاه ٣. پرچین ۴. سرگین تر

**ڕیتاڵ**[٢]: ناوەڵـناو. هەڵـوەدا؛ لانـەواز؛ پەڕتـەوازە؛ ڕەبەنی عەودال ☰ ویلان

**ڕیتاڵە**[١] **/ r̄îtałe/**: ☜ ڕیتاڵ[١]ـ٤

**ڕیتاڵـە**[٢]: ناوەڵـناو. ١. ڕووتەڵـە ٢. دەربـەدەر؛ بێ‌خانەولانە ☰ ١. ژندەپوش ٢. آوارە

**ڕیتاڵی / r̄îtałî/**: نـاو. گەڕیـدەیی؛ ئـاوارەیی ☰ آوارگی

**ڕیتڕیتۆک / r̄îtr̄îtok/**: ناوەڵناو. زەحیری؛ تووشیاری زگەشۆرە ☰ اسهالی

**ڕیتق / r̄îtiq/**: ناو. جیقنە؛ ڕیقنە؛ گـووی باڵـدار ☰ پیخال؛ مدفوع پرندە

**ڕیتک / r̄îtik/**: ناو. ١. تەکانی توند ٢. پەڕۆی کۆن و دڕاو ٣. بەرگەدە؛ بەرسک ٤. ڕیتکـە؛ ئـامێژەن؛ هەوێنی پەنیر ٥. جۆرێ کولێرەی بـە ڕۆن ☰ ١. تکان؛ جنبش ٢. کهنەی پارە ـ پارە ٣. پایین شکم ۴. پنیرمایە ۵. نوعی نان روغنی

**ڕیتکوپیتک / r̄îtik û pîtik/**: نـاو. ڕیتکەوپیتکـە؛ ڕیت‌وپیت؛ خـرت‌وپـرتی ناومـاڵ؛ وردەوپـردە ☰ خرت‌وپرت

**ڕیتکە / r̄îtke/**: ناو. ١. هەوەڵ شـیری تێکـەڵ بـە ژەک ٢. ڕیتک؛ هەوێنی پـەنیر ٣. ئـارد و ئـاوی لێکـدراو؛ هـەویری زۆر شـل و خۆنـەگرتوو ☰ ١. اولین شیر آمیختە با آغوز ٢. پنیرمایە ٣. خمیـر بسـیار آبکی

**ڕیتکەوپیتکە / r̄îtkewpîtke/**: ☜ ڕیتکوپیتک

**ڕیتگە / r̄îtge/**: ☜ ڕەگ ـ١

**ڕیتم / r̄îtm/**: نـاو. ١. کێشی مووسیقا ٢. کـرژی و خاوی دەنگ و ئاهەنگ ☰ ١و٢. ریتم

**ڕیتن / r̄îtin/**: چاوگ. ١. ڕژتن؛ ڕشتن؛ ڕژانـدن ٢. ڕیان؛ ڕیتن ☰ ١. ریختن ٢. ریدن

**ڕیتوپیت / r̄ît û pît/**: ☜ ڕیتکوپیتک

**ڕیتە**[١] **/ r̄îte/**: ناو. قالبە گۆرەوی ☰ قالب جوراب

**ڕیتـە**[٢]: ناوەڵـناو. داڕژاو؛ دە قالـب ڕژاو ☰ در قالـب ریختە شدە

**ڕیتەڵ / rîteł/**: ناوەڵناو. لەڕ و لاواز ☰ لاغر و نحیف

**ڕیچ**[١] **/ r̄îç/**: ناو. ١. ددانی گڕ و بەرچاو ٢. ددان بە سەر یەکدا ساوین لە تووڕەیی ٣. پەیڕەو؛ بەرنامە ☰ ١. دندان‌های درشت و نمایان ٢. دنـدان‌قروچـە از خشم ٣. برنامە

⊡ **ڕیچ بوونەوە**: چیڕ بوونەوە؛ ددان لە سـەر یـەک دەرخستن بە هـۆی ئـێش، تـووڕەیی و ... ☰ دندان برهم فشردن و چهرە در هـم بـردن از درد، عصبانیت و ...

**ڕیچ کردن**: ددان بە سـەر یەکـدا نیشـان‌دان لـە

تووڕەیی ☰ دندان‌قروچە کردن لز خشم

**ڕیچ**[٢]: ناوەڵناو. ١. گـرژ؛ ناوچاوتاڵ ٢. چیـڕ؛ تایبەتمەندی کەسێ کە هەمیشە ددانی دیارە ☰ ١. اخمو ٢. ویژگی کسی کـە دنـدان‌هـایش همیشـە پیداست

**ڕیچار / r̄îçar/**: ناو. ١. قسەی لە بـن لێوانـەوە کـە تێی‌نەگەن ٢. ڕەچەڵ؛ ڕیچاڵ؛ مـەرەبا؛ میـوەی کوڵێندراوی خەستەوەکراو ☰ ١. سخن نـامفهوم و زیرلبی ٢. مُربا

**ڕیچاڵ / r̄îçał/**: نـاو. ١. شـیرەمەنی؛ سـپیاتی؛ هەرچی لە شیر پەیدا دەبێ ٢. ☜ **ڕیچار–٢** ☰ ١. لبنیات ٢. ☜ **ڕیچار–٢**

**ڕیچۆ / r̄îço/**: ناو. ددانەگڕی ☰ دندان‌قروچە

⊡ **ڕیچۆ کردن**: ددان لێ‌گـڕ کردنـەوە؛ دان نیشـان دان بۆ گەف و هەڕەشە ☰ دندان‌قروچە کردن بە تهدید

**ڕیچە / r̄îçe/**: دەنگەناو. دەنگـی بـە سـەر یـەکا ساوینی ددان ☰ صدای برهم سایدن دندان‌ها

**ڕیچە پۆل / r̄îçepol/**: نـاو. چڵـپاو؛ قـوڕ و لیتـە؛ قوڕاوی خەست ☰ لای و لجن

**ڕیچەرمو / r̄îçermû/**: ☜ **ڕیش‌سپی**

**ڕیحاڵ / r̄îĥał/**: ناو. زین؛ کەرستەی سـەر پشـتی ئەسپ بۆ لە سەر دانیشتن ☰ زین

**ڕیحان / r̄îĥan/**: ☜ **ڕیحان**

**ڕیحانی / r̄îĥanî/**: ناو. جۆرێ ترێ ☰ نوعی انگور

**ڕیخ / r̄îx/**: ناو. ڕەم؛ شیاکە ☰ سرگین

⊡ **ڕیخ کرن**: تەپالە پێژان ☰ تاپالە ساختن

**ڕیخاو / r̄îxaw/**: ناو. ئاوی تێکـەڵ بـە ڕیـخ ☰ آب آمیختە بە سرگین

**ڕیخـاوی / r̄îxawî/**: ناوەڵـناو. ١. شـیاکاوی؛ ڕیخ‌پێ‌هەڵپڕژاو ٢. *[پلار]* خوێـڕی و بێکـارە ☰ ١. سرگین‌آلود ٢. بیکارە

**ڕیختمان / r̄îxt(i)man/**: ناو. برێژ؛ ڕیتە؛ دارێژگە ☰ قالب ریختەگری

**ڕیخک / r̄îxik/**: نـاو. ڕیخکـێ؛ جـۆرێ هـەنجیری خراپ ☰ نوعی انجیر نامرغوب

**ڕیخکەر / r̄îxker/**: ناو. تەپاڵەپێژ ☰ کسی کە تاپالـە می‌سازد

**ڕیخکێ / r̄îxkê/**: ☜ **ڕیخك**

**ڕیخگلێنە / r̄îxg(i)lêne/**: ناو. خلێنکە؛ گووخلێنکە؛ کێزک ☰ سرگین‌غلتان

**ڕیخلۆنی / r̄îxlonî/**: ناو. خیزەڵان ☰ ریگزار

**ڕیخن / r̄îxin/**: ناوەڵناو. ١. *[پلار]* لـەڕ و لاواز ٢. زەحیر ☰ ١. لاغر ٢. اسهال

**ڕیخناخ / r̄îxnax/**: ناو. زیخەڵان؛ خیـزەڵان؛ زەوی داپۆشراو لە زیخ ☰ ریگزار

**ڕیخنـاک / r̄îxnak/**: ناوەڵـناو. *[پـلار]* شـیاکاوی؛ سـەنیراوی ‹لـە پـەشمی ڕیخنـاکی بـەر سمێلـت/ نەڕیسن سەرکەلە و دەسبەند و هەوسار «شێخ ڕەزا»› ☰ آلودە بە سرگین

**ڕیخنە**[١] **/ r̄îxne/**: ناو. ١. جیقنـە ٢. ڕیپـۆق ☰ ١. پیخال ٢. ژفک

**ڕیخنە**[٢]: ناوەڵناو. *[پلار]* ١. بێکـارە و بـێ‌هونـەر ٢. لاوازی پیس ☰ ١. بی‌هنر و هرزە ٢. لاغر کثیف

**ڕیخنـەخۆرە / r̄îxnexore/**: نـاو. شـاوەڕیخنە ☰ گاوچرانک

**ڕیخۆ / r̄îxo/**: ناوەڵناو. ١. ڕیخاوی؛ شیاکە پێوە تلاو ٢. *[پلار]* خوێڕی؛ بێکارەی هیچ لێ نەهاتوو ☰ ١. سرگین‌آلود ٢. بیکارە و بی‌هنر

**ڕیخۆڵە / r̄îxołe/**: ناو. ١. ڕوخڵـە؛ ڕۆڤـێ؛ ڕووڤـێ؛ ڕیڤـێ؛ ڕوویڤـک؛ ڕیڤـیک؛ ڕۆدی؛ ڕۆڵـەخوای؛ ڕیخەڵۆ؛ ڕیخەڵۆک؛ ڕیخەڵۆکە؛ ڕێلەخۆ؛ لـەغروو؛ ئور؛ پزور؛ بەشێک لە کۆئەندامی هەرسەک لە بەر گەدەوە هەتا کـۆم ٢. بزگـوڕ؛ بـەرگی دڕاو ☰ ١. رودە ٢. لباس پارە

▦ **ڕیخۆڵەی ئەستور**: ☜ **ڕیخۆڵەی گەورە**

**ڕیخۆڵەی باریک** ڕیخۆڵە باریک؛ ڕیخۆڵە بچووک؛ ڕۆڤی زراڤ؛ بەشێک لە ڕیخۆڵە بریتی لە دوانزەگرێ، ڕیخۆڵەی بەتاڵ و ئیلیۆم ☰ رودەی کوچک

**ڕیخۆڵەی گەورە** ڕیخۆڵەی ئەستوور؛ زبلەک؛ سور؛ ڕیخۆڵە ئەستوورە؛ ڕۆڤی ڕەش؛ ڕۆڤی ستوور؛ لێخەروو گەورا؛ گورگانەخوەرد؛ بەشێ لە ڕیخۆڵە بریتی لە ڕیخۆڵەکوێرە، قوولون (کوولون) و ڕیخۆڵەی ڕاست ☰ رودەی بزرگ

**ڕیخۆڵەئەستور / r̂îxołe'estûr/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ئازا و بەبڕشت ☰ جسور و کاری

**ڕیخۆڵەئەستورە / r̂îxołe'estûre/**: ☜ **ڕیخۆڵەی گەورە**

**ڕیخۆڵەدرێژ / r̂îxołed(i)rêj/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* بە سەبر و خۆڕاگر ☰ صبور

**ڕیخۆڵەکوێرە / r̂îxołek(i)wêre/**: ناو. ڕووخلا کۆر؛ ڕووڤی‌کوور؛ سەرەتای ڕیخۆڵەی ئەستوور کە ئەپاندیس لە بنیدایە ☰ رودەی کور

**ڕیخۆڵەکێش / r̂îxołekêş/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* کۆڵنەدەر و ماندوویی‌نەناس ☰ جسور و خستگی‌ناپذیر

**ڕیخەتاڵە / r̂îxetałe/**: ناو. شیاکەی شلی مالات کە بەهاران گیای شین دەخۆن و تەڕەکی دەگرێ ☰ مدفوع شُل احشام

**ڕیخەخۆرە / r̂îxexore/**: ناو. کوڕکوڕە؛ باڵندەیەکە لە زڕەکەو دەکا ☰ سنگخواره

**ڕیخەدارو / r̂îxedarû/**: ناو. ئاوڕێژە؛ گیاکتک؛ سملەتیف؛ گیایەکە بۆ دەرمان دەبێ ☰ سنبل‌الطیب؛ علف گربه

**ڕیخەڕەشە / r̂îxeřeşe/**: ناو. نەخۆشییەکی ڕەشەولاغە لە سەرماوە تووشی دێ ☰ نوعی بیماری دام

**ڕیخەژاڵە[1] / r̂îxejałe/**: ناو. ڕیخەژاڵە؛ گیایەکی تالە ☰ گیاهی تلخ

**ڕیخەژاڵە[2]**: دژوعا. ڕیخەژاڵە؛ زەهرەمار؛ وشەی وەرامی تووڕەیی و لە ڕووی ناڕەزاییەوە ☰ زهرِ مار

**ڕیخەشلە / r̂îxeş(i)le/**: ناو. نەخۆشی فیرکەی ئاژەڵ ☰ اسهال حیوانات

**ڕیخەلان / r̂îxełan/**: ناو. ۱. کۆشکەلان ۲. کەولە؛ کەوەلە ☰ ۱. شوله ۲. ریگزار

**ڕیخەلۆ / r̂îxeło/**: ☜ **ڕیخۆڵە-۱**

**ڕیخەلۆک / r̂îxełok/**: ☜ **ڕیخۆڵە-۱**

**ڕیخەلۆکە / r̂îxełoke/**: ☜ **ڕیخۆڵە-۱**

**ڕیز[1] / r̂îz/**: ناو. ۱. سەف؛ سەفە؛ ڕاف ‹لە ڕیگوزەری بووکا بەرامبەر/ دوو ڕیز، دوو-دوو سوار لێی ئەهاتە دەرا «گۆران»› ۲. ڕادە؛ هەند ‹لە ڕیزی زەبر و زەنگی وان کەسێکی‌تر نەبوو هەرگیز/ بە شیر و حیشمەتی کوردە کە ماوە دەوڵەتی ئێران «حاجی قادر»› ۳. قەدر؛ ڕێز ☰ ۱. صف ۲. حد؛ اندازه ۳. احترام

⊡ **ڕیز بوون** ڕێز بەستن؛ قەتار بەستن؛ یەک لە شوێن یەکدا بوون ☰ ریسه شدن

**ڕیز بەستن** ☜ **ڕیز بوون**

**ڕیز کردن** ڕێز کردن؛ لە تەنیشت یەکەوە دانان ☰ به صف کردن

**ڕیز گرتن** ۱. ڕیز بوون؛ سەرە گرتن ‹ تەماشای هەر شتێ دەکەم، ڕەنگی پاییزی گرتووە/ جوانی خۆی لێ شاردوومەوە، دزێوی ڕیزی گرتووە «هێمن»› ۲. ☜ **ڕێز گرتن** ☰ ۱. به صف شدن ۲. ☜ **ڕێز گرتن**

**ڕیز لێگرتن** ☜ **ڕێز لێنان**

**ڕیز[2]**: ئاوەڵناو. وردیلە؛ بچکەلە ☰ ریز؛ خُرد

**ڕیزاڵ / r̂îzał/**: ئاوەڵناو. ڕێزگاڵ؛ ڕیشاڵ؛ ڕێزۆڵە؛ ڕێزەلانە؛ باریکەڵەی وەک دەزوو ☰ باریک نخ مانند

**ڕیزاڵ ـ ڕیزاڵ / r̂îzał r̂îzał/**: ئاوەڵناو. ڕێزاڵ-ڕێزاڵ؛

ڕێزە ـ ڕێزە؛ پارچە ـ پارچەی باریکەڵەی وەک دەزوو 🇮🇷 رشتە ـ رشتەی ریز ـ ریز

**ڕیزان** / řîzan/: ☜ **ڕسکێن**[1]

**ڕیزبەندی** / řîzbendî/: ناو. پۆلێن؛ کاری بە ڕیز کردنی شتان بە گوێرەی تایبەتمەندییە هاوبەشەکانیان 🇮🇷 ردەبندی

**ڕیزپەڕ** / řîzpeř/: ئاوەڵناو. دەگمەن؛ کەموێنە 🇮🇷 استثنایی

**ڕیزکەر** / řîzker/: ئاوەڵناو. جەلەبەست؛ جەلەبەند 🇮🇷 ردیف‌ساز احشام

**ڕیزکێن** / řîzkên/: ☜ **ڕسکێن**[1]

**ڕیزلانە** / řîzlane/: ☜ **ڕێزلانە**

**ڕیزۆم** / řîzom/: ناو. زەوینی جێ باغ 🇮🇷 زمین محل باغ

**ڕیزە**[1] / řîze/: ناو. ڕزن؛ ڕز 🇮🇷 ردیف؛ صف

**ڕیزە ـ**[2]: پێشوشە. وردە ـ ‹ڕیزەدار› 🇮🇷 ریزە ـ

**ڕیزهەڤ** / řîzhev/: ئاوەڵناو. ١. هاوڕیز؛ هاوڕزن؛ لە یەک ڕیزدا ٢. تایبەتمەندی ئەو وشانەی بە ڕواڵەت یەک نین و بە مانا یەکن 🇮🇷 ١و٢. مُترادف

**ڕیزین** / řîzîn/: ☜ **ڕسکێن**[1]

**ڕیژ** / řîj/: ☜ **ڕێژە ـ٢**

**ڕیژاڤ** / řîjav/: ناو. تافگە؛ تاڤگە؛ تاف 🇮🇷 آبشار

**ڕیس** / řîs/: ☜ **ڕێس**[1]

◘ **ڕیس کردنەوە خوری**: *[کینایی]* ڕەنج دانەبا؛ ئاکام و ئەنجامی کارێک تێکدان و لە بەین بردن ‹دایەگەورە هەموو ڕیسمانی کردەوە خوری و نەقشەکەمانی بەتاڵ کردەوە› 🇮🇷 رشتەها را پنبە کردن

**ڕیسپی** / řîspî/: ☜ **ڕیش‌سپی**

**ڕیست** / řîst/: ئاوەڵناو. ڕێسراو 🇮🇷 ریسیدە

**ڕیسک** / řîsk/: ناو. بەڤ؛ مەترسی؛ جەربەزەیی؛ دوبەختی؛ دووبەختەکی؛ دەبێ یان نابێ؛ دۆخی مل نان بە کارێکەوە کە ئاکامی نادیارە 🇮🇷 ریسک

**ڕیسوا** / řîswa/: ئاوەڵناو. ئابڕووبەماو؛ ناوزڕاو 🇮🇷 رسوا

**ڕیسوایی** / řîswayî/: ☜ **ڕسوایی**

**ڕیس‌وخوری** / řîs û xurî/: ☜ **ڕیس‌وگوریس**

**ڕیس‌وگوریس** / řîs û gurîs/: ناو. *[مەجاز]* ڕیس‌وخوری؛ کردار یان قسەی دوور و درێژ ‹ئەم ڕیس‌وگوریسەی بۆ چییە؟ بە کوردی و کورتی قسەی خۆت بکە!› 🇮🇷 عمل یا گفتار دور و دراز

**ڕیسە** / řîse/: ناو. ڕەسەت؛ باوانی؛ پێتەک؛ پێتک 🇮🇷 جهاز عروس

**ڕیسی** / řîsî/: ناو. گزرە؛ گیای گێرەکراو 🇮🇷 پرس؛ گیاه کوبیده برای علوفه

**ڕیش** / řîş/: ناو. ١. ڕهـ؛ ڕدێن؛ ڕندێن؛ ئەڕدێن؛ ڕێن؛ ڕیـن؛ ڕی؛ ڕیـهـ؛ ڕێـوی؛ هەردیسە؛ ڕهـە؛ موویەک کە لە ڕوومەت و زۆرتر لە چەناکە و ژێر زنج و گوپی پیاودا دەڕوێ ٢. موویەکی درێژ کە لە چەنە و ژێر چەنەی بڕێک گیانەوەران (وەک: بزن) دەردێ 🇮🇷 ١و٢. ریش

◘ **ڕیش تاشین**: مووی دەم و چاو لابردن 🇮🇷 ریش تراشیدن

**ڕیش دانان**: ڕیش هێشتنەوە؛ ڕدێن دانان 🇮🇷 ریش گذاشتن

**ڕیش هێشتنەوە**: ☜ **ڕیش دانان**

**بوونە ڕیش کەسێکەوە**: بوونە ڕیشەوە؛ بە سەر کەسێکدا سەپان ‹ئەم هەتیوانە بوونە ڕیشمەوە› 🇮🇷 وبال گردن شدن

**بوونە ڕیشەوە**: ☜ **بوونە ڕیش کەسێکەوە**

**بە ڕیش کەسێکەوە کردن**: کردنە ڕیشەوە؛ بە سەر کەسێکدا سەپاندن ‹ئەو ئاسنجاوەیان کردە ڕیشمەوە› 🇮🇷 بە ریش کسی بستن

**چوون بۆ سمێڵ و ڕیش دانان**: لە دووی شتێکی سووک چوون و شتێکی قورس دۆڕاندن 🇮🇷

پی سبیل رفتن و ریش گذاشتن
**کردنە ڕیشەوە:** ☜ **بە ڕیش کەسێکەوە کردن**
**ڕیشا / řîşa/:** ناو. دمەڵی پیس؛ کوانی حەستەم ☰ غُدەی بدخیم
**ڕیشاژۆ / řîşajo/:** ☜ **ڕەگاژۆ**
**ڕیشالۆک / řîşalok/:** ناو. تەرخون؛ ڕیشالوو؛ ڕیشالۆک؛ توونەگیواو؛ جۆرێک سەوزی خواردنە ☰ گیاه ترخون
**ڕیشاڵ[1] / řîşał/:** ناو. ڕیشاڵە؛ تاڵی سروشتی یان دەستکردی ناسک و درێژ (وەک هی گیا، خورما و ...) ☰ لیف
**ڕیشاڵ[2]:** ☜ **ڕێزاڵ**
**ڕیشاڵکراوە / řîşałk(i)rawe/:** ناوەڵناو. هەنجراو؛ شیەوەکراو ☰ ریش ـ ریش شده
**ڕیشاڵۆک / řîşoałok/:** ☜ **ڕیشالۆك**
**ڕیشاڵوو / řîşoałû/:** ☜ **ڕیشالۆك**
**ڕیشاڵە / řîşałe/:** ☜ **ڕیشاڵ**
**ڕیشان / řîşan/:** ناو. فیبر؛ ڕیشاڵە؛ هەموو جۆرە هەودایەک کە لە پیشەسازی، بەتایبەت هەوداچنیدا بە کار دەچێ ☰ فیبر
**ڕیشبابا / řîşbaba/:** ناو. ڕیشباوا؛ سەرەقوولە؛ هەنگوور کەڵەشێری؛ جۆرێ ترێی دەنک درێژ و درشتی ئاودار ☰ ریش‌بابا (انگور)
**ڕیشباوا / řîşbawa/:** ☜ **ڕیشبابا**
**ڕیشپان / řîşpan/:** ناوەڵناو. *[پەلار]* ڕدێنزل ☰ ریش‌پهن
**ڕیشتاش / řîştaş/:** ناو. خۆتراشی ڕیش؛ مەکینەی ڕیش تاشین ☰ ریش‌تراش
**ڕیشتر / řîştir/:** ناو. یەکەی پێوانی تەوژمی بوومەلەرزە کە بە ژمارەی ١ تا ٩ پیشان دەدرێت ☰ ریشتر
**ڕیشچەرموو / řîşçermû/:** ☜ **ڕیشسپی**
**ڕیشخەن / řîşxen/:** ناو. *[کینایە]* ڕشخەن؛ ڕشقەن؛ تیتاڵی؛ گاڵتە؛ گەمە؛ گەپچار؛ جەفەنگ؛ تیز؛ قەژمەری؛ تەوزە؛ کاری گاڵتە کردن و پێکەنین بە کەسێ ☰ ریشخند
**ڕیشدار / řîşdar/:** ناوەڵناو. ڕدێندار؛ بەڕدێن؛ ڕیشوو؛ ڕیشن ☰ ریشو
**ڕیشدرێژ / řîşd(i)rêj/:** ناوەڵناو. خاوەن ڕدێنی درێژ ‹هەرکەسێکی گەر ئەویندار و برینداربێ دەڵێ:/ سۆفیانی ڕیشدرێژ، خوێنیان لە کاسەی کردووە «ئاوات»› ☰ درازریش
**ڕیشدەرمان / řîşderman/:** ناو. گیایەکە ☰ زرنباو
**ڕیشسپی / řîşs(i)pî/:** ناو. ڕیچەرموو؛ ڕیشچەرموو؛ ڕیسپی: ١. ئیختیار ٢. *[کینایە]* پیاوماقووڵی گوند ☰ ١و٢. ریش سفید
**ڕیشکۆ / řîşko/:** ☜ **ڕیشوو[1]**
**ڕیشکە / řîşke/:** ☜ **ڕیشوو[1]**
**ڕیشگ / řîşig/:** ☜ **ڕیشوو[1]**
**ڕیشن / řîşin/:** ☜ **ڕیشدار**
**ڕیشوە / řîşwe/:** ☜ **ڕیشوو[1]**
**ڕیشوەگر / řîşwegir/:** ناوەڵناو. بەرتیلخۆر ☰ رشوه‌گیر
**ڕیشۆک / řîşok/:** ☜ **ڕیشوو[1]**
**ڕیشۆکە / řîşoke/:** ناو. بنەچەکە؛ چووزەڕیشە؛ بەچکە ڕیشەی گیای تۆمدار کە پاشان دەبێتە ڕیشەی سەرەتایی ☰ ریشه‌چه
**ڕیشۆڵ / řîşoł/:** ناو. ١. ڕیشاڵ ٢. ☜ **ڕەشۆڵە** ☰ ١. لیف ٢. ☜ **ڕەشۆڵە**
**ڕیشۆڵە / řîşołe/:** ناو. ١. ☜ **ڕەشۆڵە** ٢. دیمەشۆرە؛ گڵێکی گزموولەکراوی سپی ڕەنگە ژنان خۆیان پێ دەشۆرد ٣. تاڵە ڕیشەی ناسک لە برێ ڕوەکدا کە بژیو لە زەوی هەڵدەمژێ ☰ ١. ☜ **ڕەشۆڵە** ٢. روشوره ٣. ریشک
**ڕیشۆڵی / řîşołî/:** ☜ **ڕەشۆڵە**
**ڕیشۆڵێ / řîşołê/:** ☜ **ڕەشۆڵە**

**ڕیشوو¹** / řîşû/: ناو. ڕیشگ؛ ڕیشکۆ؛ ڕیشکە؛ ڕیشۆک؛ ڕیشی؛ ڕیشوە؛ ڕیشە؛ بەنی بادراوی هەڵوەشاوی کەنارەی پارچە ‹ئەو شۆخە کە چەفیەی لە سەر و گەردنی ئاڵان/ ڕیشەی دڵی عوشاقی بە ڕیشووی ڕەشی پچڕان «بێخود»› ☰ شنگله

**ڕیشوو²**: ئاوەڵناو. ڕیشدار ☰ ریشو

**ڕیشە** / řîşe/: ناو. ١. ڕیشگ؛ ئاجار؛ پنجاڕ؛ پنج؛ پنجک؛ بنج؛ ڕپن؛ قورتیس؛ ڕەگ و بنی گیا؛ بەشی ڕووتەڵ و بنەهەردی گیای تۆمدار کە ئەندامی هەڵکێشان و نیاتە کردنی خۆراکە و دەبێتە هۆی پتەوی و خۆڕاگری گیا ‹ڕیشەی دار› ٢. بنەچەک؛ بنەڕەت؛ بنیات؛ بنەما و سەرچاوەی شتێک ‹دەبێ ڕیشەی نەخوێندەواری لە بن دەربێ› ٣. *[مەجاز]* ڕەگ و ڕیشە؛ ئاخێزگە یان مێژینەیەکی دیار و ڕوون ‹دژمنایەتییان لەگەڵ کوردان ڕیشەیەکی کۆنی هەیە› ٤. ☜ **ڕیشوو¹** ٥. *[زمانناسی]* ئاخێزگەی سەرەتایی وشە ٦. *[زمانناسی]* ڕەگ؛ وشەیێ کە بە زێدەکردنی واژۆکە یان وشەیەکیتر، وشەیەکی نوێی لێ چێ ببێ (وەک: «ڕۆ» کە وشەگەلی: ڕۆیشتن، بڕۆ، پێشڕۆ و... لێ دروست دەبێ) ☰ ١تا٣. ریشه ۴. ☜ **ڕیشوو¹** ٥و٦ ریشه

⊡ **ڕیشە دەرهاتن**: *[کینایی]* کردار دەرهاتن؛ لە ڕێزە کەوتن ‹ئەوەندەم خەرج کرد ڕیشەم دەرهات› ☰ جان به لب آمدن

**ڕیشە کوتان**: ١. ڕەگ و ڕیشە داکوتان ٢. *[کینایی]* پەرە سەندن و سەقامگیر بوون ☰ ١. ریشه دواندن ٢. استوار شدن

**بە ڕیشەی کەسێکدا چوونە خوار**: *[کینایی]* هیچ شتێ بۆ کەسێ نەهێشتەوە ☰ کسی را نیست و نابود کردن

**لە ڕیشەی شتێکەوە چوونە خوار**: *[کینایی]* هیچ (لێ) نەهێشتن؛ توخم بڕین؛ تەواو کردن ☰ ته چیزی را در آوردن

**ڕیشەبڕ** / řîşebiř/: ئاوەڵناو. شولگەنە؛ لەناوچوو ☰ ریشه‌کن

**ڕیشەبزن** / řîşeb(i)zin/: ناو. گیایەکە بنێکی وەک گێزەری هەیە، ڕەنگی سپییە و دەخورێ ☰ گیاهی است

**ڕیشەدار** / řîşedar/: ئاوەڵناو. بەڕیشە: ١. خاوەن پنج و پنجک ‹گیای ڕیشەدار› ٢. *[کینایی]* خاوەن تۆرەمە و بنەچەکەیەکی ناسراو و پایەبەرز ‹مرۆی ڕیشەدار› ☰ ١و٢. ریشه‌دار

**ڕیشەکەن** / řîşeken/: ناو. بنەبڕ: ١. بنبڕاو لە ڕیشە ‹باسریشک، دارەکانی ڕیشەکەن کرد› ٢. *[کینایی]* نابووت؛ لەبەینچوو ‹نەخۆشی هاوڵە لە جیهاندا ڕیشەکەن کرا› ☰ ١و٢. ریشه‌کن

**ڕیشەلۆک** / riselok/: ☜ **ڕەگەز**

**ڕیشەناسی** / řîşenasî/: ناو. ١. بەشێ لە زانستی زمانناسی کە لە سەر گۆڕانکاری وشە تا سەرەتاییترین شێوەی دەکۆڵێتەوە ٢. لێکۆڵینەوە لەمەڕ سەرچاوەی بەدیهاتنی شتێ، بەتایبەت ئاخێزگە و هۆی بەدیهاتنی نەخۆشی ☰ ١و٢. ریشه‌شناسی

**ڕیشەیی¹** / řîşeyî/: ئاوەڵناو. بنەڕەتی؛ بنەمایی ‹چارەسەری ڕیشەیی› ☰ ریشه‌ای

**ڕیشەیی²**: ئاوەڵکار. لە ڕیشەوە؛ لە بن و بێخەوە؛ بە شێوەی بنەڕەتی ‹بۆ لابردنی گەندەڵی دەبێ ڕیشەیی کار بکرێت› ☰ ریشه‌ای

**ڕیشی** / řîşî/: ☜ **ڕیشوو¹**

**ڕیغ** / řîğ/: ناو. خیز؛ زیخ ☰ رَمل

**ڕیف** / řîf/: ناو. قاش؛ پارچەیەک لە میوەی بێستان ☰ قاچ

**ڕیفراندۆم** / řîfrandom/: ناو. گشتپرسی؛ کۆپرسان ☰ همه‌پُرسی

**ڕیف / řîv/**: ناو. ڕووی؛ ڕووف؛ تووکەبەر ☰ موی زهار

**ڕیڤاس / řîvas/**: ☜ **ڕێواس**

**ڕیڤان**[1] **/ řîvan/**: چاوگ. بزووتن؛ جووڵانەوە ☰ حرکت کردن

**ڕیڤان**[2]: ئاوەڵناو. ڕێزان؛ شارەزای ڕێگە ☰ راه بلد

**ڕیڤن / řîvin/**: ئاوەڵناو. پیس؛ چڵکن؛ گەمار ☰ کثیف

**ڕیڤۆک / řîvok/**: ناو. شەمەترێلکە؛ جۆرێ زەرگەتەی درێژۆکەیە هەنگوینی هەیە ☰ نوعی زنبور عسل وحشی

**ڕیق**[1] **/ řîq/**: ☜ **ڕیپۆق**

**ڕیق**[2]: ئاوەڵناو. نەرمی سیس‌هەڵاتوو ☰ پلاسیده

**ڕیقن / řîqin/**: ئاوەڵناو. *[پلار]* ڕیقنە؛ ڕیق‌وفیق؛ ڕیقۆ؛ ڕیقۆڵە؛ ڕیقە؛ ڕینک؛ لەڕ و لاواز؛ تەواو بێ‌هێز ☰ ریقو؛ لاغرمردنی

**ڕیقناسە / řîqnase/**: ناو. قورگ؛ قوڕوو؛ قوڕێ؛ ئەوک ☰ حلق

**ڕیقنە**[1] **/ řîqne/**: ناو. جیقنە؛ ڕیتق؛ ڕیقنە؛ ڕیخنە ‹ڕیقنەکەی بۆ ئیمەیە و هێلکەکەی بۆ خەڵکی «مەسەل»› ☰ پیخال؛ فَضلەی پرنده

**ڕیقنە**[2]: ☜ **ڕیقن**

**ڕیقنەسپیکە / řîqnes(i)pîke/**: ناو. جۆرێ نەخۆشی مەلی ماڵی ☰ از بیماری‌های پرندگان خانگی

**ڕیقنەسپیلکە / řîqnes(i)pîlke/**: ناو. جیقەسپیلکە؛ جۆرێ نەخۆشی کوشندەی مریشک و کەڵەباب و فڕندەیە ☰ نوعی بیماری پرندگان

**ڕیق‌وفیق / řîq û fîq/**: ☜ **ڕیقن**

**ڕیقۆ / řîqo/**: ☜ **ڕیقن**

**ڕیقۆڵە / řîqołe/**: ☜ **ڕیقن**

**ڕیقە / řîqe/**: ☜ **ڕیقن**

**ڕیکلام / řîklam/**: ☜ **ڕێکلام**

**ڕیکنای / řîknay/**: چاوگ. کۆڕاندنەوە ☰ چندباره گفتن

**ڕیکورد / řîkurd/**: ناو. بانترین ئەندازە (لە چەند و چۆنی) کە بە هۆی کارێکەوە دەست بکەوێ ☰ رکورد

**ڕیکۆ / řîko/**: ئاوەڵناو. ڕیش‌درێژ ☰ ریش‌بلند

**ڕیکە / řîke/**: دەنگەناو. ڕیگە: ١. جیرە ٢. سیرەی ددان ☰ ١. صدای نوک قلم ٢. صدای دندان به هم ساییدن

**ڕیگ / řîg/**: ناو. تۆزێکی بە بریقەیە بۆ مەرەکەف لە قاقەز مژین ☰ گرد خشک‌کن

**ڕیگلاژ / řîglaj/**: ناو. وردەکاری ڕێک کردنی کەرەسەیەک بۆ ئەوەی باش کار بکا ☰ رِگلاژ

**ڕیگە / řîge/**: ☜ **ڕیکە**

**ڕیل / řîl/**: ☜ **ڕەول**

**ڕیلاس / řîlas/**: ئاوەڵناو. *[پلار]* ڕێلاس؛ گۆسارتمە؛ ڕووقایم؛ ڕووداماڵیاگ؛ بێ شەرم و حەیا ☰ پررو؛ گُستاخ

**ڕیلی / řîlî/**: ناو. گۆیژ؛ گڤیشک؛ بلچ ☰ زالزالک

**ڕیمڵ / řîmił/**: ☜ **ڕیمیڵ**

**ڕیمۆسک / řîmosk/**: ☜ **ڕموسك**

**ڕیمۆڵە / řîmołe/**: ناو. ڕێشکە و پێشکەی چاو ☰ حالت دودو زدن چشم

**ڕیمیڵ / řîmîł/**: ناو. ڕیمڵ؛ ماکێکی ڕەنگی چەور و ڕەش بۆ ڕشتنی برژانگ ☰ ریمل

**ڕین**[1] **/ řîn/**: ☜ **ڕیان**[1]

**ڕین**[2]: ☜ **ڕیش ـ١**

**ڕینج / řînc/**: ☜ **ڕەگ ـ٣**

**ڕینجبەر / řîncber/**: ☜ **ڕەنجبەر**

**ڕینجۆ / řînco/**: ئاوەڵناو. گۆج؛ ئیفلیج ☰ افلیج

**ڕینک / řînk/**: ☜ **ڕیقن**

**ڕینگ**[1] **/ řîng/**: ناو. ١. ☜ **ڕنگ**[1] ٢. خوری کە

بە دەست لە پێستەی دەڕنێنەوە ٣. مەیدانی کێبەرکێی مستانێ کە دەوراندەوری بە تەناف گیراوە ٤. *[میکانیک]* بازنەیەکی چودەنی کە پیستون لە سەر سیلەندرەوە ڕادەگرێ و لە تێچوونی گاز بۆ ناو کارتێل یان ڕۆن بۆ ناو سیلەندر بەرگری دەکا ٥. ویل؛ بازنەی کانزایی چەرخی ماشین، کە تایەی پێوە دەنرێت ☰ ١. ☜ ڕنگ[1] ٢. پشمی کە با دست از پوست چینند ٣تا٥. رینگ

⊡ **ڕینگ بەردان**: ☜ ڕینگ دانەوە

**ڕینگ دانەوە**: ڕینگ بەردان؛ شیرە دانەوەی دۆشاو و دانەوێلەی چێشت ☰ شیرە پس دادن

**ڕینگ**[2]: ☜ ڕنگ[2]

**ڕینگاڵ**[1] / ř̂ingał/: ☜ ڕنگ[1]

**ڕینگاڵ**[2]: ئاوەڵناو. شڕۆڵ؛ جل‌شڕ ☰ ژندەپوش

**ڕینگاندنەوە** / ř̂ingand(i)newe/: ☜ ڕنگانەوە

**ڕینگانەوە** / ř̂inganewe/: چاوگ. ١. شیرە دانەوەی دۆشاو و دانەوێلە ٢. ☜ ڕنگانەوە ☰ ١. شیرە پس دادن ٢. ☜ ڕنگانەوە

**ڕینگاو** / ř̂ingaw/: ناو. تراوی خەست و خۆڵ وەک ئاوی خەستی سەر و پێ ☰ مایع غلیظ‌شدە

**ڕینگنای** / ř̂ingnay/: چاوگ. ڕیوەڕیو کردن ☰ ژاژخاییدن

**ڕینگۆڵ** / ř̂ingoł/: ناو. بزگوڕ؛ تیتۆڵ ☰ وصلەپارە

**ڕینگە** / ř̂inge/: ناو. بۆڵەبۆڵ؛ پرتەپرت ☰ غرولند

**ڕینگەڕینگ** / ř̂ingeřing/: ناو. ڕینگەی زۆر ☰ غرولند زیاد

**ڕینگیای** / ř̂ingyay/: چاوگ. قسەی دوور لە ئاوەز گوتن ☰ گزافە گفتن

**ڕیوار** / ř̂iwar/: ناو. ڕێگا؛ سەرڕێ ‹کەم کەم چیم لە دەر ماڵ مەشەی موورای/ یەی عفریتی دیم، وە ڕیوارت نای «شامی»› ☰ راه

**ڕیواڵ**[1] / ř̂iwał/: ☜ ڕنگ[1]

**ڕیواڵ**[2]: ↓

⊡ **نانە ڕیواڵ کەسێکەوە**: نیانە ڕەت کەسێکەوە ‹تا هێزم تێدا بوو نامە ڕیواڵییەوە نەمگرت!› ☰ دنبال کسی دویدن

**ڕیواڵە** / ř̂iwałe/: ناو. باریکە؛ تیزماڵک ☰ باریکە؛ نوار

**ڕیوایەت** / ř̂iwayet/: ناو. وتە، هەواڵ یان باسی پیغەمبەر یان پیاوانی ئایینی‌تر ☰ روایت

**ڕیوون** / ř̂iwun/: ☜ ڕێحان

**ڕیوە**[1] / ř̂iwe/: ناو. فڕ و فێڵ ☰ مکر و فریب

**ڕیوە**[2]: ئاوەڵناو. بەڵەک؛ بازگ؛ دووڕەنگ، بەتایبەت ڕەش و سپی (مانگا) ☰ ابلق (گاو)

**ڕیوەڕیو** / ř̂iweřiw/: ناو. ١. پرتەپرت؛ بۆڵەبۆڵ ٢. کاری گوتنەوەی قسەی بێ‌تام ☰ ١. غرولند ٢. ژاژخایی

⊡ **ڕیوەڕیو کردن**: گوتنەوەی قسەی بێ‌تام ☰ ژاژ خاییدن

**ڕیوەڕیوکەر** / ř̂iweřiwker/: ئاوەڵناو. مزەمزکەر؛ درێژدادڕ؛ هەرزەگۆ ☰ ژاژخا

**ڕیوەڵ** / ř̂iweł/: ☜ ڕیوەڵە

**ڕیوەڵە** / ř̂iwełe/: ئاوەڵناو. *[پلار]* ڕیوەڵ؛ زەردەڵەی لاواز ☰ لاغر مُردنی

**ڕیوەن** / ř̂iwen/: ناو. باسکلاو؛ کلاوبن؛ بنی ڕێواس ☰ راوند؛ ریشەی ریواس

**ڕیوی** / ř̂iwî/: ☜ ڕێوی-١

**ڕیەگە** / ř̂(i)yege/: ☜ ڕێگا

**ڕیەن** / ř̂(i)yen/: ناو. ڕان؛ مێگەل؛ ڕێن ☰ گلەی گوسفند

**ڕیه** / ř̂ih/: ناو. ڕدێن؛ ڕیش ☰ ریش

**ڕیهتن** / ř̂ihtin/: چاوگ. ١. ڕژاندن؛ ڕژانن ٢. ڕژان؛ ڕژیان ☰ ١و ٢. ریختن

**ڕیهەڤ** / ř̂ihev/: ئاوەڵناو. هەڤاڵ؛ هاودەم؛ خەمڕەوێن ☰ همدم

**ڕێ**[1] / ře/: نـاو. ١. نـاوی پـیتی دوازدەهـەمی ئـەلفوبێـی زمـانی کـوردی ٢. ڕێگـا؛ ڕێگـە؛ بوارگەیـەک بـۆ هـاتوچـۆ و ڕاگواسـتنەوە لـە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی‌تر (وەک: شـەقام، جـادە، هێڵی ئاسن و...) ٣. ڕێگەیێ کە لـە شـوێنێکەوە بۆ شوێنێکی‌تر پێوراوە ‹ڕێیەکی زۆرمـان بـڕی تـا گەیشتینە ئەوێ› ٤. ڕێگا؛ ڕێباز ‹هەر کەسێک بـە ڕێی خۆیدا دەڕۆیشت› ٥. ڕێگـا؛ شـێواز؛ ڕەوشـی کار ‹ڕێی دەرس خوێندنت فێـر ئەکـەم› ٦. هـۆی گەیشتن بە شتێ یان بە شوێنێک ‹خەریک بـوو ڕێی بوونە وەزیری خۆش دەکرد› ٧. ڕێگا؛ مـەودا؛ ڕاگە ‹تا ئەوێ ڕێیەکی زۆرمان لەبـەرە› ٨. ئیـزن؛ ئیجازە ‹منیش هەر وەکوو فەرەنجی لە بـەر/ ڕێـی ژوورم نییە و ئەوەستم لە دەر «موفتی پێنجوێنی»› ٩. خەت لە قوماشدا ☰ ١. رِ؛ نام حـرف دوازدهـم الفبای زبان کردی ٢تا٧. راه ٨. اجازه ٩. خطِ پارچه

▣ **لە ڕێی کەس/ شتێک:** بۆ خاتری کەس/ شتێک؛ لە پێناوی کەس/ شـتێک ‹هـەموو عـومرم لـە ڕێی هاتونەهاتی/ بە سەر چوو ئەی ئەجەل هـەر تـۆ نـەهاتی! «حـاجی قـادر»› ☰ در راه کسـی/ چیزی

⊡ **ڕێ بردن:** ڕێ دۆزینەوە؛ ڕێ تێ‌بردن؛ چوونـە ناو جێگایـەک ‹تـەنیا سـێ کـەس ڕێ دەبەنـە قۆناخی کۆتایی› ☰ راه بردن

**ڕێ بڕین:** پێـوانی مەودایـەک ‹هەنگـەزەردە ئەبـڕێ ڕێـی دوور/ بـۆ بینـینی گوڵاڵـەی سـوور «گۆران»› ☰ راه رفتن؛ راه پیمودن

**ڕێ بەر خستن:** ڕێ بەر نان؛ سپاردنی کارێ بـە کەسێ ☰ سپُردن کاری به کسی

**ڕێ بەر نان:** ١. ☜ **ڕێ بەر خستن** ٢. تەگبیر بۆ کردن ☰ ١. ☜ **ڕێ بەر خستن** ٢. راهنمایی کردن

**ڕێ بەستران:** بەر ڕێ گیران ☰ بسته شدن راه

**ڕێ بەستن:** بەر ڕێ گرتن ‹دوێشـەو بـەفر، ڕێـی بەستبوو› ☰ راه بستن

**ڕێ پێ دران:** دەرفەت/ مەودا پـێ دران ☰ آزاد (مُباح) شدن

**ڕێ پێ گرتن:** ١. ڕێ بڕین؛ چەتەیی کـردن ٢. *[کنایه]* بوونە لەمپەر لە بـەر کەسـێ ‹ڕێ پـێ گرتم و نەیهێشت بخوێنم› ☰ ١. راهزنـی کـردن ٢. مانع شدن

**ڕێ پێ گیران:** قەدەغە کران؛ بەر پێ گیران ☰ ممنوع شدن

**ڕێ پێوان:** ١. ڕێگە چوون ٢. خۆ پیشان‌دان ☰ ١. راه پیمودن ٢. تظاهرات کردن

**ڕێ تێ‌چوون:** شیاوی پێکهـاتن بـوون ‹ڕێ تـێ دەچـێ تووشـی زەحمـەتێکی زۆر بـین› ☰ امکان‌پذیر بودن

**ڕێ تێ‌کەوتن:** بە هەڵکەوت چوونـە شـوێنێ ☰ اتفاقی به جایی رفتن

**ڕێ خستن:** خستنە ڕێ: ١. هەرکاندن؛ خستنە کار ‹دە میلەت مەجلیسێ ڕێ خەن! بـەڵام ئـەو مەجلیسە حوڕ بێ/ نەوەک مەجلیسێ بێ‌قیمـەت لە ژێر دەسکاری بێگانە «قانع»› ٢. بـە ئـەنجام گەیاندنی کار یان ویستی کەسـێک ‹دەسـتی خـۆش بـێ؛ کارەکـەی ڕێ خسـت› ٣. بـە ڕێ کـردن ‹نـەدەچووم، ئـەو مـنی ڕێ خسـت› ٤. بەڕێوە بردن کـار و بارێـک ‹کۆبوونەوەیـەکیان لەم بارەوە ڕێ خست› ☰ ١. ایجاد کـردن ٢. بـه انجام رساندن ٣. روانه کردن ٤. برگزار کردن

**ڕێ داگرتن:** وە ڕێ کەوتن؛ دەست بە ڕۆیشتن کردن ☰ راه افتادن

**ڕێ دان:** ڕێگا دان: ١. بوار دان؛ ڕێگـا کردنـەوە بۆ تێپەڕین ‹ڕێ بدەن با ئـەم مندالـە بـڕوا› ٢. بەرایی دان؛ ئیجازە دان ‹ڕێ نـادەن قسـەکەی بکا› ☰ ١. راه دادن ٢. اجازه دادن

**ڕێ دەرکردن:** ڕێگە دۆزینەوە ▪ راه را یافتن

**ڕێ دەست بون/ هەبون:** ☜ **ڕێ هەبون**

**ڕێ شکاندن:** ڕچە شکاندن؛ چوون بە ڕێگایەکدا کە کەس پێیدا نەچووبێ ‹یا توربەتێ، یا غوربەتێ با ڕێ بشکێنین/ هەر مونتەزیرە نالی ئەگەر مرد و ئەگەر ما «نالی»› ▪ راه نارفته را رفتن

**ڕێ ڤەبرن:** جێبەجێ کردن ▪ انجام دادن

**ڕێ ڤەکرن:** ☜ **ڕێ کردنەوە ـ١**

**ڕێ کردن:** ١. چوونە ڕێدا ‹یەک ساعەت ڕێمان کرد تا گەیشتین› ٢. بە ڕێ کردن ‹گەر لە ژێر چەتری شەفاعەت ڕێمنەکەی چ بکەم ئەمن؟/ کوێ بچم کوێر و فەقیر، ناشارەزایی مەحشەرم «ئاوات»› ٣. ڕێ دان بۆ ڕۆیشتن ‹دڵ لە میحنەت کەیلە، ڕێم کەن با لە غەم دەرچم لە شار/ ئەمڕۆ ڕۆژێکە لە جەمعی مەردومان بگرم کەنار «سالم»› ▪ ١. راه پیمودن ٢. روانه کردن ٣. راه دادن

**ڕێ کردنەوە:** ١. ڕێ ڤەکرن؛ ڕێگا باز کردن ٢. جێ کردنەوە ▪ ١. راه را گشودن ٢. گُنجانیدن

**ڕێ کەوتن:** ١. کەوتنە ڕێ بۆ سەفەر یان شوێنێک ‹ئازاد دوێنێ ڕێ کەوت و جارێ نەگەیشتووە› ٢. ڕێک کەوتن؛ پێکهاتن ‹لەسەر قیمەتی ماڵەکە ڕێ کەوتین› ٣. پێکهاتنی پێشەکی پێویست بۆ کردنی کار ‹کارگەکەیان ڕێ کەوت› ٤. ڕاو نان؛ دوا کەوتن بە غار ٥. ڕێ تێ‌کەوتن؛ بە هەڵکەوت چوونە شوێنێ ‹ڕۆژێ ڕێم کەوتە سەر بەندی شاخێ/ کێویکی دارسان بەرزەدەماخێ «قانع»› ٦. بۆ ڕەخسان ‹شازادەیی و من گەدا و هەژارم/ چۆن ڕێم دەکەوێ ببیتە یارم «هەژار، *مەم و زین*»› ▪ ١. حرکت کردن؛ راهی شدن ٢. توافق کردن ٣. راه افتادن ۴. با شتاب دنبال کردن ۵. دست دادن ۶. مُمکن شدن

**ڕێ گرتن:** جەردەیی کردن ‹ئەگەییە دامەنی دەستی دوعا، سا دەبمە خاکی ڕێی/ تەریقەی گوشەگیری بەردەدەم، ئەمجارە ڕێ دەگرم «مەحوی»› ▪ راهزنی کردن

**ڕێ گرتنە بەر:** وە ڕێ کەوتن بە ڕێگایەکدا ‹ڕێم گرتۆتە بەر، زۆر بە چالاکی/ ئەڕۆم و ئەڕۆم بەرەو ڕووناکی «ئەحۆل»› ▪ راه افتادن

**ڕێ گۆڕین:** *[کینایە]* ڕێ لادان؛ واز هێنان لە بڕوا ▪ تغییر مرام دادن

**ڕێ لادان:** ☜ **ڕێ گۆڕین**

**ڕێ لە بەر چوون:** بە خۆشی و ئاسوودەیی سەفەر کردن ‹هۆ خاڵەی ڕێبوار! ڕێم لە بەر ناچێ/ سەرەڕێم گرتووە بۆ تەنیا ماچێ «فولکلۆر»› ▪ آسوده سفر کردن

**ڕێ لێ‌تێکچوون:** ١. گوم کردنی ڕێگا و بە هەڵەدا ڕۆیشتن ‹ڕێم لێ‌تێکچوو، سەرم لە نەغەدەوە دەرهێنا!› ٢. *[کینایە]* سەر لێ شێوان ٣. *[کینایە]* لاڕێ بوون ▪ ١. راه گم کردن ٢. سرگردان شدن ٣. گمراه شدن

**ڕێ لێ‌گرتن:** ڕێگە لە کەس یان شتێک بەستن ▪ راه چیزی را بستن

**ڕێ نانە بەر کەسێک:** ڕێ بۆ کەسێک دانان؛ کەسێک ڕێنوێنی کردن ▪ راه پیش پای کسی گذاشتن

**ڕێ وساندن:** تێراو کردن ▪ سیراب کردن

**ڕێوە چوون:** بە ڕێدا ڕۆشتن ▪ راه رفتن

**ڕێ هەبون:** ڕێ دەست بوون/ هەبوون: ١. بۆ ڕەخسان ‹ئەگەر ڕێت هەیە، یارمەتییەکم بدە!› ٢. شێوازی شیاو هەبوون ‹هەر کارێ ڕێی خۆی هەیە› ٣. ئیجازە هەبوون ‹ڕێم هەیە جگەرەیەک بکێشم؟› ▪ ١و٢. راه داشتن ٣. اجازه داشتن

**بردنە ڕێوە**: ١. بە ڕێدا بردن ٢. گەڕاندن؛ هەڵسووڕاندن 🇮🇷 ١. حرکت دادن ٢. چرخاندن؛ اداره کردن

**خستنە ڕێ**: دابین کردنی بارودۆخی وە ڕێ کەوتن 🇮🇷 راه انداختن

**کەوتنە ڕێ**: ١. خەریک ڕۆیشتن بوون ‹دیر کەوتینە ڕێی› ٢. دەست پێ کردنی ڕەوتانەیەک ‹سەرەنجام دەزگاکان کەتنە ڕێ› 🇮🇷 ١. حرکت کردن ٢. راه افتادن؛ شروع به کار کردن

**هاتنە ڕێ**: سازیان؛ ساچیان 🇮🇷 راه آمدن

**هاتنە ڕێدا/ ڕێوە**: بە ڕێدا هاتن؛ نەوەستان 🇮🇷 حرکت کردن

**ڕێ**[٢]: ئامراز. پێ؛ بە؛ لێ 🇮🇷 بر

◘ **ڕێ خستن**: پێدا ماڵین؛ پیا ساوین 🇮🇷 مالیدن بر

**ڕێ خشاندن**: کیراندن؛ کیرانن؛ پێدا خشاندن 🇮🇷 ساییدن بر چیزی

**ڕێبار / řêbar/**: ☜ **ڕێبوار**

**ڕێباز / řêbaz/**: ناو. ڕێواز؛ ڕێبازگە: ١. ڕێگەی هاتوچووی زۆر ‹ڕێی ناکەوێ تۆی ببێ بە داخواز/ تووشم دێ هەزاری وا لە ڕێباز «هەژار، *مەموزین*»› ٢. کۆمەڵە ئامۆژەگەلێکی دینی کە پەسندی تاقمێک لە شوێنکەوتوانی ئەو دینەیە ‹ڕێبازی شافیعی› ٣. ئایین یان ئامۆژەیەکی تایبەت ‹ڕێبازی بودایییەکان› ٤. شێواز؛ شێوەی هونەری یان ئەدەبی ‹ڕێبازی کلاسیزم› ٥. دۆز؛ مەرام ‹ڕێبازی شۆڕش بەر نادەم/ مەودا بە داگیرکەر نادەم «هێمن»› 🇮🇷 ١. مکان عبورومرور عمومی ٢. مذهب ٣و ٤. مکتب ٥. مسلک

**ڕێبازگە / řêbazge/**: ☜ **ڕێباز**

**ڕێبڕ / řêbiř/**: ☜ **ڕابڕ**

**ڕێبگار / řêb(i)gar/**: ☜ **ڕێبوار**

**ڕێبوار / řêb(i)war/**: ناو. ڕابگار؛ ڕابوار؛ ڕاویار؛ ڕێبار؛ ڕێوار؛ ڕێوگار؛ ڕێبگار؛ ڕێوبوار؛ ڕێونگ؛ ڕێوینگ؛ ڕێڤنگ؛ ڕێڤنگی؛ ڕێڤی؛ ڕێڤینگ؛ کەسێ کە بە ڕێگایەکدا یان بەرەو ئامانجێک بە ڕێوەیە ‹ڕێبوار ئەڕوا و سەگ ئەوەڕێ «مەسەل»› 🇮🇷 رهگذر

**ڕێبواری / řêb(i)warî/**: ناو. سەفەر؛ موسافەرەت ‹ڕێبوار و ڕێبوار، ڕێبواری ناکەم/ لە دوای باڵاکەت دلداری ناکەم «فولکلۆر»› 🇮🇷 سفر

**ڕێبەر / řêber/**: ناو. ١. ڕابەر؛ ڕەهبەر؛ پێشەوا؛ پێشەنگ؛ ئەو کەسەی ڕێ پیشان ئەدا و خەڵک شوێنی دەکەون ‹ڕێبەر بە و ڕێبڕ مەبە «مەسەل»› ٢. سەرکردە؛ سەرۆک؛ یەمان؛ یەکمان؛ گەورەی گشت؛ کەسێ کە میللەت یان کۆمەڵێک ڕێبەری دەکا ‹خوسرەوپاشا بووە ڕێبەر و ڕێشاندەرمان و لە ئازارمان بوو بە دەرمان و ... «هەژار، *شەرەفنامە*»› ٣. باخچەی بەر دێ ٤. ☜ **ڕابڕ** 🇮🇷 ١و٢. رهبر ٣. باخچەی پایین آبادی ۴. ☜ **ڕابڕ**

**ڕێبەرایەتی / řêberayetî/**: ☜ **ڕێبەری**

**ڕێبەری / řêberî/**: ناو. ڕابەری؛ ڕێبەرایەتی: ١. کاری ڕاپەڕاندن و بەڕێوە بردنی پۆل یان کۆمەڵێک بۆ گەیشتن بە ئارمانج و ئامانجگەلی دیاریکراو ٢. بەڕێبەرایەتی؛ بەڕێوەبەرایەتی؛ کۆڕ یان پێگەیێک کە ئەم کارانەی لە ئەستۆدایە 🇮🇷 ١و٢. رهبری

**ڕێبەست / řêbest/**: ناو. بەربەست؛ بەربەس؛ ڕێبەند؛ لەمپەری سەر ڕێگە 🇮🇷 راهبند

**ڕێبەند / řêbend/**: ناو. هەرکام لەو ئامێرانەی بەر بە هاتوچۆ لە سەر ڕێگایەک دەگرن (وەک زنجیر، لۆسە و ...) 🇮🇷 راهبند

**ڕێبەندان / řêbendan/**: ناو. ١. مانگی یازدەهەمی ساڵی ئێرانی کە ٣٠ ڕۆژە ٢. ڕابەنان؛ دۆخی

بەسترانی ڕێ و وێستانی هاتوچۆ ‹لە شەقامی سالم بە هۆی پێکدادان، ڕێبەندانێ بوو هەر مەپرسە!› ☰ ١. بهمن ماه ٢. راهبندان

**ڕێبیر** / řêbîr/: ناو. دۆز؛ مەرام ☰ مرام؛ مسلک

**ڕێبین** / řêbîn/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* چازان؛ ڕێزان؛ خاوەن مشوور ☰ چارەگر

**ڕێپان** / řêpan/: ناو. چاوەڕوانیی؛ چاوەنواڕیی ☰ چشم‌انتظاری

**ڕێپۆش** / řêpoş/: ناو. پۆشەنی ڕووکاری کۆڵان و شەقام (وەک: ئیسفالت؛ سەنگکاری؛ مووزاییک و...) ☰ راهفرش

**ڕێ پێلکە** / řêpêlke/: ناو. پلیکان؛ پلەکان ☰ پلکان

**ڕێپێو** / řêpêw/: ناو. ڕێبوار؛ ئەوەی ڕێ دەپێوێ ☰ رهرو

**ڕێتار** / řêtar/: ناو. سەفەر بە شەودا ☰ شبروی

**ڕێتەی** / řêtey/: چاوگ. ڕژتن؛ ڕژاندن ☰ ریختن

**ڕێجە** / řêce/: ناو. دەریچە؛ دریچە؛ بۆتەی زێڕینگەران ☰ بوتەی زرگری

**ڕێچ** / řêç/: ☜ **ڕچە ـ١**

**ڕێچار** / řêçar/: ☜ **ڕێگەچارە**

**ڕێچارە** / řêçare/: ناو. ڕێچار؛ ڕێگەچارە؛ فورمووڵ؛ شێوەی چارەسەری گرفت و پرسێک ☰ راەحل

**ڕێچاڵ** / řêçał/: ناو. چالایی نێوان ڕان و پشت؛ قووڵایی جوچکە سمت ☰ گودی لگن خاصره

**ڕێچک** / řêçik/: ☜ **ڕچە ـ١**

**ڕێچکە** / řêçke/: ناو. ١. ☜ **ڕچە ـ١** ٢. خێزەرە؛ دۆخی لە ڕیزێکدا ڕۆیشتن (زیاتر بۆ مێروو) ☰ ١. ☜ **ڕچە ـ١** ٢. صف (ویژەی حشرات)

◻ **ڕێچکە بەستن**: ڕێچکە کردن؛ خێزەرە کردن؛ بە ڕیز ڕۆیشتن ‹پێش ئەوەی حاجی سەلەمخۆر، هەژارێک هەڵێ بە تەماڵ/ پێش ئەوەی ڕێچکە ببەستن، بۆ مزگەوتێ شان‌بەبەرماڵ «هێمن»› ☰ به صف رفتن

**ڕێچکە کردن**: ☜ **ڕێچکە بەستن**

**ڕێچنای** / řêçnay/: چاوگ. ڕژاندن ☰ ریختن

**ڕێچیای** / řêçyay/: چاوگ. ڕژان ☰ ریختن

**ڕێحان** / řêĥan/: ناو. ڕحان؛ ڕیحان؛ ڕێحانە؛ ڕیوون؛ گیایەکی ئالیکی یەکساڵەیە، بە گەڵای هێلکەیی بەرانبەر بە یەک و ددانەدارەوە کە بۆن و تامێکی خۆشی هەیە و بۆ سەوزی خواردن بەکار دێ ☰ ریحان

**ڕێحانە** / řêĥane/: ☜ **ڕێحان**

**ڕێحانەکێویلە** / řêĥanekêwîle/: ناو. گیایەکی بۆنخۆش و خۆڕسکە، گەڵاکەی وشک دەکەن و وەک چا دەم دەکرێ بۆ ژانە زک باشە ☰ گیاهی است

**ڕێخ** / řêx/: ناو. ١. بێخ؛ بنج؛ بنی گیا ٢. زیخ؛ خیز؛ چەو ‹ڕێخ بورگێ لە ڕۆخانە، هەر خوێش خاسترە لە بێگانە «مەسەل»› ٣. ڕەم؛ شیاکە ☰ ١. بیخ؛ بُن ٢. شن و ماسه ٣. سرگین

**ڕێخان** / řêxan/: ناو. قەمچان؛ بازەڵێن؛ بازەڵان ☰ یەقول‌دوقول

**ڕێخت** / řêxt/: ناو. بیچم؛ تەرح؛ سەر و سیما ☰ ریخت؛ سر و سیما

**ڕێختمان** / řêxt(i)man/: ناو. قالبی داڕژانی کانزا ☰ قالب ریخته‌گری

**ڕێختە** / řêxte/: ئاوەڵناو. ڕەختە؛ قایم و پتەو ☰ مُحکم

**ڕێخراو**[1] / řêx(i)raw/: ☜ **ڕێکخراوە**

**ڕێخراو**[2]: ئاوەڵناو. بەرهەڤ و دەست بە کار کراو ‹کارگەی ڕێخراو› ☰ راەاندازی شده

**ڕێخراوە** / řêx(i)rawe/: ☜ **ڕێکخراوە**

**ڕێخشۆر** / řêxşor/: ناو. ڕێخەوشۆر؛ بەردەشۆر ☰ شستشوی غله برای جدا کردن سنگریزه از آن

**ڕێخناخ / řêxnax/**: ناو. ڕێخەڵان: ١. شوێنی ڕەڵم؛ ڕەڵماوی ٢. بەردەڵان ☰ ١. ریگستان ٢. سنگلاخ

**ڕێخە / řêxe/**: ناو. کاری ڕێخستن؛ پیماڵین ☰ مالش

**ڕێخەدارو / řêxedarû/**: ناو. گیاکتک؛ گیاپشیلە ☰ علف گُربە؛ سُنبل‌الطیب

**ڕێخەر[1] / řêxer/**: ناو. ١. پیماڵ؛ پیاساو ٢. ئەو کەسەی ماشین، دەزگا، کارخانە یان دامەزراوەیەک بەرهەڤ دەکا و دەیخاتە ڕێ ☰ ١. ساینده ٢. راه‌انداز

**ڕێخەر[2]**: ئاوەڵناو. بە تایبەتمەندی ڕێ خستنەوە ‹کار ڕێخەر› ☰ راه‌انداز

**ڕێخەری / řêxerî/**: ناو. کار و ڕەوتی ڕێخستن؛ بەرهەڤ‌کردن و خستنە ڕێی ماشین، دەزگا، کارخانە یان دامەزراوەیەک ☰ راه‌اندازی

**ڕێخەژاڵە / řêxejałe/**: ☜ **ڕیخەژاڵە**

**ڕێخەڵان / řêxełan/**: ☜ **ڕێخناخ**

**ڕێخەوشۆر / řêxewşor/**: ناو. نیسکەشۆر؛ کار و ڕەوتی شۆردنی خەڵە و دانەوێڵە بۆ خاوێن کردنەوەی لە ڕێخ و خۆڵ ☰ عمل آبکشی حبوبات

**ڕێدار / řêdar/**: ناو. ١. ☜ **ڕێوان** ٢. باجگری سەر ڕێ ٣. ڕێبوار؛ ڕێبگار ☰ ١. ☜ **ڕێوان** ٢. باجگیر سر راه ٣. رهگذر

**ڕێدەر / řêder/**: ناو. بەرایی‌دەر ☰ رُخصت‌دهنده

**ڕێرەڤان / řêrevan/**: ☜ **ڕێوان**

**ڕێرەوان / řêrewan/**: ☜ **ڕێوان**

**ڕێرەو[1] / řêřew/**: ناو. ڕێبوار ☰ رهرو

**ڕێرەو[2]**: ئاوەڵکار. بە هەڵکەوت؛ هەڵکەتی؛ گزوگومەت ‹ڕێرەو تووشی بووم› ☰ اتفاقی

**ڕێ ، ڕێ / řê řê/**: ئاوەڵناو. ڕا ـ ڕا؛ خەت ـ خەت؛ میل ـ میل؛ بە نەخشی هێڵ ـ هێڵ لە پەنا یەک ‹کولەنجە ڕێ ـ ڕێ دەسماڵ کریشە/ کاری ئەمن و تۆ کەوتوەتە کێشە «فولکلۆر»› ☰ راه ـ راه

**ڕێز[1] / řêz/**: ناو. ١. قەدر؛ کەل؛ حورمەت؛ هورمەت؛ ئاکارێ کە نیشانەی وەرگرتنی بایەخ، گرنگی و پلەی بەرزی کەس یان شتێکە ٢. ڕیز؛ سەف ٣. خیز؛ چەو ٤. دێڕ؛ خەتێک لە نووسین ٥. پاژ؛ بەش ☰ ١. احترام ٢. صف؛ ردیف ٣. شن ٤. سطر ٥. جزء

⊡ **ڕێز پێوە گرتن**: یەک ـ یەک بە هەموان گەیاندن ☰ یکی ـ یکی به همه رساندن

**ڕێز کردن**: ☜ **ڕێز گرتن**

**ڕێز گرتن**: ڕێز کردن؛ ڕێز نان؛ ڕیز گرتن: ١. قەدر گرتن ٢. یادی خێر کردن ☰ ١. احترام گذاشتن ٢. گرامی داشتن

**ڕێز لێگرتن**: ☜ **ڕێز لێنان**

**ڕێز لێنان**: ڕیز/ ڕێز لێ‌گرتن؛ قەدر گرتن ☰ احترام گذاشتن

**ڕێز نان**: ☜ **ڕێز گرتن**

**ڕێز[2]**: ئاوەڵناو. ڕیز؛ ورد؛ وردیلە ☰ ریز

• **ڕێز[3]**: پاشەوشە. ـ ڕێژ؛ ـ وەر؛ ڕژێن ‹گوڵڕێز› ☰ ـ ریز

**ڕێزاڵ / řêzał/**: ناو. ڕیشاڵ؛ پارچەی باریک و وەک هەودا ☰ پارچەی باریک نخ مانند

**ڕێزاڵ • ڕێزاڵ / řêzał řêzał/**: ☜ **ڕیزاڵ ـ ڕیزاڵ**

**ڕێزان[1] / řêzan/**: ئاوەڵناو. ١. شارەزا؛ ڕێگەزان؛ بەڵەدی ڕێ ٢. *[کینایە]* کارزان و پسپۆڕ ☰ ١. راه‌شناس ٢. دانشمند

• **ڕێزان[2]**: پاشەوشە. لە حاڵی وەرینەدا ‹گەڵاڕێزان› ☰ ـ ریزان

**ڕێزانە / řêzane/**: ناو. پاداش؛ بەخشش لە بەرانبەری کاری چاکدا ☰ پاداش

**ڕێزاهەنگ / řêzaheng/**: ناو. ڕێ و ڕەسم و ئاهەنگی ڕێز لێ نان لە کەس، ڕۆژ یان بابەتێکی

دەگمەن ☰ مراسم گرامیداشت

**ڕێزای / řêzay/**: چاوگ. وەرین؛ داوەریـن ‹پـەل ـ پەل خەزانان مەڕێزان نـە خـاک/ مەکـەران چـوون نیش پەسردەی دڵ چاک ـ چاک «بێسـارانی»› ☰ فروریختن

**ڕێزتەی / řêztey/**: چـاوگ. وەریـــن؛ ڕزان ☰ ریختن

**ڕێزدار / řêzdar/**: ئاوەڵناو. خـاوەنڕێـز؛ بـەڕێز ☰ مُحترم

**ڕێزک / řêzik/**: نـاو. ١. ڕێوشـوێن؛ قـانوون ٢. دێڕی ورد ☰ ١. قانون ٢. سطر ریز

**ڕێزگاڵ / řêzgal/**: ☜ ڕیزاڵ

**ڕێزگر / řêzgir/**: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی کەسێ کە ڕێز دەگرێت ☰ احترام‌گیر؛ تکریم‌کننده

**ڕێزلان / řêzlan/**: ☜ ڕێزلانە

**ڕێزلانە / řêzlane/**: ئاوەڵناو. ڕێـزلان؛ ڕێزلاینـنـە؛ ڕێزەلانە: ١. زۆر باریک ٢. زۆر ورد ☰ ١. باریـک نخ مانند ٢. بسیار ریز

**ڕێزلانە / řêzłane/**: ئاوەڵکار. ڕێزەلانە؛ کەمووکـە ‹ڕێزلانەیەک دەنگت بەرزەو کە!› ☰ اندک

**ڕێزلاینـنە / řêzłaynne/**: ☜ ڕێزلانە

**ڕێزلە / řêzłe/**: ☜ ڕەزڕەزۆک

**ڕێزمان / řêzman/**: ناو. دەستووری زمان؛ لقێـک لە زانستی زمانەوانی کە دەپەرژێتە سـەر وشـە، پێکهاتـە و ڕیزبەنـدی ڕسـتەکانی زمانێـک ☰ دستور زبان

**ڕێزمانی / řêzmanî/**: ئاوەڵناو. سـەر بـە ڕێزمـان ‹هەڵەی ڕێزمانی› ☰ دستور زبانی

**ڕێزناو / řêznaw/**: ناو. سەرناوێک بۆ ڕێـز لێنـان (وەک خانم، کاکە و دادە و...) ☰ لقب (احترام‌آمیز)

**ڕێزنـای / řêznay/**: چـاوگ. وەرانـدن؛ ڕزانـدن ‹هەور نۆ جار کلاوە و کلاو/ مەگێلۆ ئەسرین مەڕێزنۆ وە ناو «مەولەوی»› ☰ ریختن

**ڕێزۆک / řêzok/**: ناو. ڕێژگە؛ جێگەی خـوێ دانی ماڵات و ئاژەڵ ☰ جای نمک پاشیدن برای دام

**ڕێزۆڵە / řêzołe/**: ☜ ڕیزاڵ

**ڕێزە[1] / řêze/**: ئاوەڵناو. ١. کەمووکـە؛ پیچـەک؛ هندکەک ٢. بەرانبـەر لـە پایـەدا ☰ ١. خُـرده ٢. همپایه

◘ **لە ڕێزەی کەسێکدا بوون**: هـاو پلـە و پایـەی کەسێک بوون ‹کچم لە ڕێزەی کوڕی ئەودایـە› ☰ هم‌شأن کسی بودن

**ڕێزە ـ[2]**: پێشوشە. وردە ‹ڕێزەنان› ☰ خُرده ـ

**ـ ڕێزە[3]**: پاشەوشە. وردە ‹بارێزە› ☰ ـ ریزه

**ڕێزەبەڕێزە / řêzebeřêze/**: ئاوەڵکار. ورد ـ ورد و بە ڕێژە ‹باران دەبارێ ڕێزەبەڕێزە/ دایمە چاوێکم لە ڕێی کاریزە «فولکلۆر»› ☰ نرم‌نرمک

**ڕێزە ـ ڕێزە / řêze řêze/**: ☜ ڕیزاڵ ـ ڕیزاڵ

**ڕێزەکاری/ řêzekarî/**: ناو. وردەکاری ☰ ریزه‌کاری

**ڕێزەلانە / řêzełane/**: ئاوەڵناو. ١. ☜ ڕیـزاڵ ٢. ☜ ڕێزلانە

**ڕێزەلـۆک / řêzełok/**: ئاوەڵناو. تـورتی وا کـە بـە توند گوشین ورد بێ (زیاتر بۆ بەرد) ☰ تُردی کـە با فشار دست بشکند (سنگ)

**ڕێـزەڵـە / řêzełe/**: نـاو. ١. ☜ ڕەزڕەزۆک ٢. ئێسـکێکی خـڕە لـە چـۆکی ماڵاتـدا ☰ ١. ☜ ڕەزڕەزۆک ٢. استخوانی گرد در زانوی احشام

**ڕێزەڵەمارانە / řêzełemarane/**: ☜ ڕەزڕەزۆک

**ڕێزەڵەمارە / řêzełemare/**: ☜ ڕەزڕەزۆک

**ڕێزەنان / řêzenan/**: ☜ ڕێزەوڵ

**ڕێزەوپێـزە / řêzewpêze/**: نـاو. خڕەوپـــڕە؛ وردیمردی؛ لاچۆپاچۆ؛ چـەکپـووش؛ کۆمەڵـە شـتی جۆراوجـۆری شـپرز لـە شـوێنێ بـلاو ☰ خرت‌وپرت

**ڕێزەوڵ / řêzewił/**: ناو. ڕێزەنان: ١. نانەڕەقـە ٢. وردەنان؛ ورتکەنان بۆ تێوەلاندن ☰ ١. نان‌خشـکه

٢. خُرده نان برای تریت

**ڕێزیانە** / řêzyane/: ☜ **ڕازیانە**

**ڕێزین** / řêzîn/: ناو. [کیمیا] هەر یەکە لە تەنگەلی نەگۆڕ یان نیمچە نەگۆڕی بێبیچم و ئاگرگر بە ڕەنگی زەردی ئامال قاوەیی کە لە دەلاندنی برێ گیاوە پێک دێ ☰ رزین

**ڕێژ**[1] / řêj/: ناو. ڕێـژە؛ نـویرە؛ خـوەرە؛ نەخۆشـی گولی ☰ جُذام

- **ڕێـژ**[2]: پاشەوشـە. ١. بـڕێژ ‹خـوێنڕێـژ› ٢. ڕژان ‹لیوڕێژ› ☰ ١و٢. ـ ریز

**ڕێـژا** / řêja/: ئاوەڵـناو. بـەپیت؛ بەرەکەتـدار ☰ پُربرکت

**ڕێژاخ** / řêjax/: نـاو. خۆڵـەبان؛ گڵـەبان ☰ خـاک پشتبام

**ڕێـژاف** / řêjaf/: نـاو. نەخۆشـی ئـاژەڵ بـە هـۆی خواردنەوەی ئاوی زۆر لە گـەرمادا ☰ استسـقای احشام

**ڕێـژاڤ**[1] / řêjav/: نـاو. ١. ☜ **ڕێـژاو** ٢. تافـگە؛ ئاوهەڵدێر ☰ ١. ☜ **ڕێژاو** ٢. آبشار

**ڕێژاڤ**[2]: ئاوەڵـناو. ١. شـپرز و شـێواو؛ پەرێشـان و بـڵاو ٢. تووشـیاری ئاڤـزەڵێک، زکەماسـێ؛ زگ پەنـەماو لـە بـەر ئـاو خواردنـەوە ☰ ١. پخـش و پریشان ٢. دچار استسقا

**ڕێژان**[1] / řêjan/: چـاوگ. تێـپەڕ. //ڕێـژات؛ دەڕێـژێ؛ بڕێژە// ١. داباریـن ‹چاوی مـن دەم دەم دەڕێـژێ، ئاوی ساف و خوێنی گەش/ دا بلێن دەریای عومانە، دوڕ و مەرجانی هەیە «نالی»› ٢. ڕژان؛ ڕژیان ٣. ڕژانن؛ ڕژاندن ‹تـا زۆر بـڕۆم زیـاتر ئـارەق بـڕێژم/ کورتتر دەبێ ڕێگای دوور و درێـژم «هـێمن»› ٤. کل دە چاو کردن ‹هـات چـاوی بـڕێژێ، کـوێری کـرد! «مەسـەل»› ☰ ١. باریـدن ٢. ریخـتن ٣. فروریزاندن ۴. سُرمه در چشم کشیدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: ڕێـژاو/ چـاوگی نـەرێنی: نەڕێژان

**ڕێژان**[2]: ناو. بارە و داهاتی زەوی ☰ حاصل زمین

**ڕێـژاو**[1] / řêjaw/: نـاو. ڕێـژاڤ: ١. ڕەزاو؛ دواوان؛ ئاوڕێژگە ٢. جۆرێ هەنجیر ☰ ١. مصب ٢. نوعی انجیر

**ڕێـژاو**[2]: ئاوەڵـناو. ١. ڕێـژاڤ؛ پەرێشـان و بـڵاو ٢. ڕێژراو؛ کل تێکێشراو ☰ ١. پریشان و پراکنـده ٢. سُرمه کشیده

**ڕێژبەر** / řêjber/: ☜ **ڕەنجبەر**

**ڕێژبێـژ** / řêjbêj/: ناو. ئاوی تایبەتی خواردنـەوە و چێشت لێنان و جل شۆردن و ... لە ماڵ ☰ آب مصرفی خانه

**ڕێژران** / řêjran/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //ڕێـژرای؛ دەڕێژرێـی؛ بـڕێژرێ// ١. ڕژان؛ ڕژیـان ٢. کـل کێشرانە چاو ☰ ١. ریختـه شـدن ٢. سـرمەکشـی شدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: ڕێـژراو/ چـاوگی نـەرێنی: نەڕێژران

**ڕێـژراو** / řêjraw/: ئاوەڵـناو. ڕێژیـاگ؛ کـل تێکێشراو ☰ سُرمه کشیده

**ڕێژگـاو** / řêjgaw/: ئاوەڵـناو. ڕەنـجبەخەسـار ☰ رنجبەباد

**ڕێژگـە**[1] / řêjge/: نـاو. ١. ☜ **ڕێـزۆك** ٢. ڕێـژاو؛ ڕێژگە؛ دواوان؛ ئەو شوێنەی کـە چـۆم تێکەڵـی ڕووباری گەورە دەبێ ☰ ١. ☜ **ڕێزۆك** ٢. مصب

- **ڕێژگـە**[2]: پاشەوشە. شوێنی ڕژان ‹ئاوڕێژگـە› ☰ ـ ریزگاه

**ڕێژڵەگەوەن** / řêjłegewen/: ناو. سـوورەگەون ☰ گَوَن سرخ

**ڕێژن** / řêjin/: ☜ **ڕیژنە**

**ڕێژنگ** / řêjing/: ☜ **ڕەشاش**

**ڕێژنگە** / řêjinge/: ناو. تافگە؛ تافـگە؛ ئاوهەڵـدێر ☰ آبشار

**ڕێژنه / řêjne/**: ناو. ڕێـژن؛ ڕەژنـە؛ ڕێـژەو؛ تـاوە بارانی توند ‹وەرە ئەی ڕێژنە بارانی بـەهاری!/ وەرە شیعری تەڕی پڕ وردەکـاری! «هـێمن»› ☰ رگبـار باران

**ڕێژوان / řêjwan/**: نـاو. ڕێی ژوانگە؛ ڕێگایـێ کـە دوو دڵدار پێک دەگەیێنێ ☰ راهِ میعادگاه

**ڕێژو / řêjû/**: ☜ **ڕەژی**

**ڕێـژە / řêje/**: نـاو. ١. بۆتـە؛ دەریچـە؛ قاڵـبی داڕشتن ٢. ڕیژ؛ خوەرە؛ پیسی؛ نەخۆشی گـوڵی ٣. خاکی شیشە ٤. سان؛ ڕێوڕەسمی مەشـقی گرۆیـەک لـە بۆنەیـەکی فەرمیـدا (جێـژن یـان دیمانەی کەسایەتییەک) لە بەرانبـەر کـەس یـان شتێکەوە ٥. ئەنـدازە بـە پێـی ئەندازەیـەکی تـر ‹ڕێـژەی دەنگـەکان دیـاری کـرا› ☰ ١. قالـب ریختەگری ٢. جُذام ٣. سنگ شیشە ۴. رژه ۵. نسبت

**ڕێژەک / řêjek/**: ناو. بـڕێژ؛ ڕیتـە؛ ڕێجـە؛ قاڵـبی داڕشتن ☰ قالب ریختەگری

**ڕێژەن / řêjen/**: ناو. ١. ڕێژەو؛ بڕشـتی خەڵـە ٢. ڕێبڕ؛ چەتە ☰ ١. بهرەی غلەی کاشتە ٢. راهزن

**ڕێژەو / řêjew/**: ناو. ١. ☜ **ڕێـژەن ـ١** ٢. ☜ **ڕێژنە**

**ـ ڕێژی / řêjî-/**: پاشەوشـە. ڕشتن ‹خوێنڕێژی› ☰ ـ ریزی

**ڕێس**[١] **/ řês/**: ناو. ریس؛ ڕێسە: ١. وەریس؛ ڕست؛ ڕستە؛ ڕشـتە؛ ڕسـتک؛ ڕسـک؛ هەڤـدە؛ هەڤـۆ؛ گشتەک؛ کشتەک؛ خوری و لۆکەی بە تەشـی و خەڕەک بـا دراو ٢. ئەسـتوورایی ‹بـام لـە سـەر ڕێسی ملی دانا› ☰ ١. رشتە ٢. ستبری

**ـ ڕێس**[٢]: پاشەوشـە. ١. بـڕێس ‹تەشـیڕێـس› ٢. ڕێسراو ‹دەسڕێس› ☰ ١. ـ ریس ٢. ـ بافتە

**ڕێسا / řêsa/**: نـاو. ڕێوشوێنی جێگرتـوو ‹یاسـا و ڕێسا› ☰ عُرف

**ڕێسازی / řêsazî/**: نـاو. کار و ڕەوتی ڕێ کێشـان؛ دروسـت کـردنی ڕێگـا بەتایبـەت لـە دەرەوەی شاران ☰ راەسازی

**ڕێسان / řêsan/**: ☜ **ڕستن**

**ڕێسای / řêsay/**: چاوگ. ڕستن ☰ ریسیدن

**ڕێستن / řêstin/**: ☜ **ڕستن**

**ڕێستەی / řêstey/**: چاوگ. ڕستن ☰ ریسیدن

**ڕێسران / řêsran/**: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //ڕێسرای؛ دەڕێسرێی؛ بڕێسـرێ// تـەنران؛ چنـدران؛ وە بـەر ڕستن کەوتن ☰ ریسیدە شدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: ڕێسـراو/ چـاوگی نـەرێنی: نەڕێسران

**ڕێسراو / řêsraw/**: ئاوەڵـناو. ڕێسـیاگ؛ بـادراو ☰ ریسیدە

**ڕێسمە / řêsme/**: نـاو. ١. گرێژەنـــە؛ پاژنـــەی هەڵـچەرخان (وەک درگـا) ٢. ئێسـقانی قـوتی جومگە کە لە ناو ئێسکێکی چاڵدا دەسووڕێت ☰ ١. پاشنەی چرخش (در) ٢. استخوان برجستەی سر مفصل

⊡ **درگـای مـاڵ لـە ڕێسمە دەرهـاوردن**: *[کینایـە]* زۆر هاتن و پێداگری کردن ‹داواکار درگای ماڵـیان لە ڕێسمە دەرهاوردگە› ☰ پاشنەی در را کندن

**ڕێسە / řêse/**: ناو. ١. ☜ **ڕێـس**[١] ٢. فرەوێـژی؛ چەنەوەری ☰ ١. ☜ **ڕێس**[١] ٢. پُرگویی

**ڕێسەر / řêser/**: ☜ **ڕێسیار**

**ڕێسیار / řêsyar/**: نـاو. ڕێسـەر؛ ئـەوەی هـەودا دەڕێسێ ☰ ریسندە

**ڕێسیاگ / řêsyag/**: ☜ **ڕێسراو**

**ڕێسین / řêsîn/**: ☜ **ڕستن**

**ڕێش**[١] **/ řêş/**: نـاو. نـژد؛ زەخمـەڵ؛ زام؛ بـرین؛ گەزندی پێست ☰ زخم

**ڕێش**[٢]: ئاوەڵـناو. برینـدار ‹دەروونم جـە داخ چـەنی نەبۆ ڕێش/ پەرێ چێش بەختم سەگ نـەوارۆ لـێش «ئەحمەدبەگی کۆماسی»› ☰ زخمی

**ڕێشـاندەر / řêşander/**: نـاو. ١. کەسـێ کـە شارەزای ڕێگەیە ‹ڕێشاندەری باش بوو بۆ هەوالان/ بردینە دەرێ لە ناو خەیالان «هەژار، *مەموزین*»› ٢. نیشانەی ڕێگـە بـۆ شـارەزایی ☰ ١. رهنمـون ٢. علامت راهنما

**ڕێشاندەری / řêşanderî/**: ناو. ڕێنمایی؛ ڕێنـوێنی ☰ رهنمونی

**ڕێشگاوی / řêşgawî/**: ناو. ١. خەیاڵ پڵاو؛ خەیاڵی خاو؛ لێکدانەوەی دوور لـە ڕاسـتی و بـێبـەهرە ‹ئەم خەڵقە کە وا تێ گـەیـیون گەیونـە مـەقسـوود/ ڕێشگاوییەکی مەحزە، بـە دەردی مـن و تـۆ چـوون «مەحوی »› ٢. نیشانەی ڕێگە بـۆ شـارەزایی ☰ ١. خیال خام ٢. علامت راهنما

**ڕێشمە / řêşme/**: ☜ ڕەشمە

**ڕێڤار / řêvar/**: ☜ ڕووبار-١

**ڕێڤاس / řêvas/**: ☜ ڕێواس

**ڕێڤگە / řêvge/**: ناو. سەرەتا؛ هەوەڵ ☰ ازل

**ڕێڤنگ / řêving/**: ☜ ڕێبوار

**ڕێڤنگی / řêvingî/**: ☜ ڕێبوار

**ڕێڤەبەر / řêveber/**: ناو. بەڕێوەبـەر؛ کارگێـڕ ☰ مُدیر

**ڕێڤـەبـەری / řêveberî/**: نـاو. بەڕێوەبەرایـەتی؛ کارگێڕی ☰ مُدیریت

**ڕێڤـی / řêvî/**: نـاو. ١. ☜ ڕێـوی[١]-١ ٢. ☜ ڕێخۆڵە-١ ٣. ☜ ڕێبوار

**ڕێڤیک / řêvîk/**: ☜ ڕێخۆڵە-١

**ڕێڤینگ / řêvîng/**: ☜ ڕێبوار

**ڕێقن / řêqin/**: ☜ ڕێقنە

**ڕێقنە / řêqne/**: ناو. ڕێقن؛ ڕیقنە؛ گووی باڵدار ☰ پیخال؛ فَضلەی پرندە

**ڕێک[١] / řêk/**: ناو. ڕێ؛ ڕا؛ ڕێگە ☰ راه

**ڕێک[٢]**: ناوەڵناو. ١. ڕاست؛ بـێچـەفت و چەوێڵـی ‹خەتێ ڕێک› ٢. تەخت؛ بێ بەرز و نزمی ‹زەوی ڕێک› ٣. بەرامبەر؛ هاوسەنگ ‹ترازووی ڕێک› ٤. دروست؛ درووس؛ پێکهاتوو ‹بەرنامەی ڕێـک› ٥. لـەبار و تـەکووز ‹کـاری ڕێـک› ٦. سەرڕاسـت ‹ژمارەی ڕێک› ٧. تەواو؛ بێ ئـەملا و ئـەو لا ‹دە ساڵی ڕێکە وەک لێکم داوە/ گیانەکەم مـەیلمان بـە یـەکتر داوە «فولکلـۆر»› ٨. هاوتـەراز؛ هاوئاسـت ‹نانا هەورەڕەش! ئەتۆ نەوی بە! لەو بەرزانـەوە وەرە بەرەو خوار/ کەم ـ کەمـە وەرە ڕێکـی زەوی بـە! لـە سەر پشتی خۆت ئەمن بکە سـوار «هـێمن»› ☰ ١. راست ٢. هموار ٣. برابر ۴. دُرُست ۵. مُنظم؛ مُرتـب ۶. رُند؛ سرراست ۷. راست؛ بی‌کم‌وزیاد ۸. هم‌سطح

◘ **ڕێک بون**: ١. بەرانبەر هاتنەوە ٢. ئاشنا بـوون ٣. جۆر بوون ‹ڕێوی کـە زانیـی نـێچیری ڕێـک بوو/ بۆ گرتن مریشک کەوتە هاتوچـوو «قـانع»› ☰ ١. هم‌اندازه شدن ٢. آشنا شدن ٣. جور شدن

**ڕێک خستن**: ١. دوو دژ لێـک ئاشـت کردنـەوە ‹شـەڕیان بـوو و ڕێکیـانم خسـت› ٢. تـەکووز کردن ‹خەمت نەبێ ناو ماڵەکەم ڕێـک خسـت!› ٣. هەماهەنگ کردنی پاژەکانی کۆمەڵێک بـۆ پێکەوە بـوون و کـار کـردن ‹سـەرۆک هـەموو ئەندامـەکانی بـۆ ئـەم کـارە ڕێـک خسـت› ٤. جێبـەجێ کـردن؛ پێـکهێنـانی پێشـەکی کارێک ‹تەدارەک ڕێک خستن› ☰ ١. دشـمنان را آشتی دادن ٢. مُنظم کـردن ٣. تنظـیم کـردن؛ هماهنگ کردن ۴. ترتیب دادن

**ڕێک کردن**: ١. تـەخت و سـاف کـردنی زەوی ‹فەرشەکە ڕێک کـە!› ٢. تـەکووز کـردن ‹بـۆ شیرزت داناون، ڕێکیان کە!› ☰ ١. هموار کـردن ٢. مُرتب کردن

**ڕێک کەفتن**: ☜ ڕێك کەوتن

**ڕێک کەوتن**: ڕێک کەفتن: ١. پێکهاتن ‹تا ڕێک نەکەون قەبیلی ئەکراد/ هەروا دەبنـە خەرابـەئاباد «حاجی قادر»› ٢. ساز بـوون ‹ ڕێـک کـەون بـا

بچین› ☰ ١. توافق کردن ٢. آماده شدن

**ڕێک هاتن**: ١. گرژ بوون و ترنجان ‹ئەو قسەی بیست، ڕێک هات› ٢. جێبەجێ بوون ‹سەرەنجام کارەکەی ڕێکی هات› ٣. ڕێک کەوتن؛ پێکهاتن ☰ ١. ابرو در هم کشیدن ٢. درست شدن کار ٣. توافق کردن

**ڕێک هاوردن**: پێکهێنانی کار؛ جێبەجێ کردن ☰ ترتیب دادن

**ڕێک**[٣]: ئاوەڵکار. ١. بە ڕێکی و پێکی؛ بە دروستی ‹خۆت ڕێک کارەکانت بکە و گوێ بە کەس مەدە!› ٢. ڕاستەوخۆ ‹لە قوتابخانەوە ڕێک هات بۆ دوکان› ٣. بە تەواوەتی؛ بێ‌کەمایەسی ‹چیت پێ‌گوتبوو ڕێک گێڕایەوە› ٤. بە تەواوی؛ بە ڕاستی ‹داری گوڵ، سەرو و چنار و لالەزار و نارەوەن/ ڕێک لە خۆشی تۆ ئەوا کەوتوونە هەڵپەڕکێ و سەما «ئاوات»› ☰ ١. با نظم و ترتیب ٢. مستقیم ٣. تماماً؛ بە طور کامل ۴. دقیقاً؛ بە درستی

**ڕێک**[٤]: ئامراز. لە یەک؛ بە یەکدا ☰ بە هم

◻ **ڕێک خستن**: دوو شت بە یەکدا ساوین ☰ دو چیز بە هم سائیدن

**ڕێک کوشین**: بە تەوژم زۆر بۆ هەموو لای کەسێ یان شتێ هێنان ‹کە ڕێک دەکوشم پەنجەی نەرم/ لەشی سرم دەبێ نەرم «هێمن»› ☰ درهم فشردن

**ڕێکاتی** / řêkatî/: ناو. کار و ڕەوتی ڕێک کەوتن ☰ توافق

**ڕێکار** / řêkar/: ناو. شێواز و ڕێی جێبەجێ کردنی کارێکی تایبەت ☰ راهکار

**ڕێکایی** / řêkayî/: ناو. ١. ئاشنایەتی؛ دۆستایەتی ٢. تەختایی زەوین ☰ ١. دوستی ٢. هموارى زمین

**ڕێکبەڕێک** / řêkbeřêk/: ئاوەڵناو. تراز ☰ هم‌سطح

**ڕێکخراو** / řêkx(i)raw/: ☞ **ڕێکخراوە**

**ڕێکخراوە** / řêkx(i)rawe/: ناو. ڕێخراوە؛ ڕێکخراو؛ ڕێخراو: ١. ناوەندێک کە لە لایەن چەن تاقم یان دەوڵەتەوە بۆ گەیشتن بە ئامانجێک داندراوە ‹ڕێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان› ٢. یەکەی سەربەخۆی کارگێڕی کە بەڕێوەبەرەکەی زۆرتر لە لایەن سەرۆک‌کۆمار یان سەرۆک‌وەزیرەوە هەڵدەبژێردرێ و دەسەڵاتی لە هەموو وڵاتدا بەربڵاوە ‹ڕێکخراوەی پاراستنی ژینگە› ٣. کۆمەڵەیەکی ئامانجدار کە شوێنکەوتووی سیستەمێکە ‹کاری بە کۆمەڵ پێویستی بە ڕێکخراوەیە› ٤. پێکهاتە ‹پاش ڕاپەڕینی ئێران ڕێکخراوەی هێزە چەکدارەکان گۆڕدرا› ☰ ١تا۴. سازمان

**ڕێکخەر** / řêkxer/: ناو. پێکهێنەر؛ کەس یان ڕێکخراوەیێ کە دامەزراوە، بزاڤ یان چالاکییەک بەڕێوە دەبا ‹ڕێکخەری خۆپیشاندانەکە، ئەنجومەنی خوێندکاران بوو› ☰ سازمان‌دهندە

**ڕێکلام** / rêklam/: ناو. ڕیکلام؛ بالگاش؛ بالگاشە؛ بانگەشە ☰ تبلیغات

**ڕێکڵاش** / řêkłaş/: ناو. شێواز ☰ سبک

**ڕێکڵاو** / řêk(i)ław/: ناو. کلاوبنە؛ لاسکی گەڵاڕێواس ☰ ساقەی برگ ریواس

**ڕێکوپێک**[١] / řêk û pêk/: ئاوەڵناو. ١. لەبار و تەکووز ‹بەرنامەی ڕێکوپێک› ٢. گونجاو ‹کوڕێکی زۆر ڕێکوپێکە› ☰ ١. مُرتب؛ مُنظم ٢. سنجیده

**ڕێکوپێک**[٢]: ئاوەڵکار. ١. بە ڕێکوپێکی ‹ڕێکوپێک کارەکانی کرد و چوو› ٢. بە جوانی ‹ڕێکوپێک قسە دەکا› ☰ ١. با نظم و ترتیب ٢. بە خوبی

**ڕێکوپێککراو** / řêk û pêkk(i)raw/: ئاوەڵناو. هەڵوەژێراو ☰ مُرتب شده

**ڕێکوپێکی** / řêk û pêkî/: ناو. ١. مرێسی؛

تەكووزی ٢. هـاوڕێژی؛ هەڤـگری ٣. دروسـتی؛ درووسی ☰ ١. نظم ٢. تناسب ٣. دُرُستی

**ڕێ‌كـورك / řêkurk/**: نـاو. كوچكـە؛ بـن‌بەسـت؛ ڕێگایـەک (بەتایبـەت كـۆلان) كـە سـەرێكی دەرناچێ ☰ بُن‌بست

**ڕێكوندـاكری / řêkwindak(i)řî/**: ناوەڵـناو. تـەیا؛ ڕێ‌لێ‌شێواو؛ ڕێ‌گوم‌كردوو ☰ گُم‌كردەراه

**ڕێكۆك / řêkok/**: نـاو. ڕێچكـە؛ باریكـەڕێ ☰ راه كم‌عرض

**ڕێ‌كوورک[١] / řêkûrik/**: ناو. ڕێگەیەک كە سەرێكی دەرناچێ ☰ بُن‌بست

**ڕێ‌كوورک[٢]**: ناوەڵناو. بەبێ ڕێگایەک بـۆ دەرچـوون ☰ بُن‌بست

**ڕێكەوت[١] / řêkewt/**: نـاو. ١. مێژوو؛ كاتی نووسراو لـە نێـو بەڵـگەدا ٢. هەڵـكەوت ‹خـودا بیـدا لـە هێلێكی دەدا، سەیری هەیـە ڕێكـەوت/ وەنـەوزم دا نیگـارم هاتـە خـەو، ئەمشـەو خـەوم پـێ كـەوت «مەحوی»› ☰ ١. تاریخ؛ مؤرخه ٢. اتفاق

**ڕێكـەوت[٢]**: ناوەڵـكار. ڕێكـەوتوو؛ بـە هەڵـكەوت ‹دەنكە زیخێكـی كوردسـتان/ لـە كەیـەوە؟ چـۆن؟ نازانم؟/ پەڕیبووە لۆچی گیرفانی چاكـەتێكم/ ئەمـڕۆ ڕێكەوت دۆزیمەوە/ دەرم هێنا و ماچم كرد و كـردم بە بەردی كەعبەی گشت شـیعرەكانم! «شـێركۆ»› ☰ اتفاقی

**ڕێكەوتـوو[١] / řêkewtû/**: ناوەڵـناو. ١. ڕوونیـا؛ لـە ڕۆیشتندا ٢. پێكهـاتوو؛ دروس بـووگ ٣. دەس بە كار كردوو ☰ ١. راهی ٢. درست‌شـده ٣. شـروع بە كار كرده

**ڕێكەوتوو[٢]**: ☜ **ڕێكەوت[٢]**

**ڕێكی / řêkî/**: نـاو. ١. بەرانبـەری ٢. دۆسـتایەتی ٣. تەختایی ٤. ڕاسـتی؛ بـێ‌چـەفت و چەوێڵـی ‹ڕاستی لە قسە و ڕێكی لە كردار› ☰ ١. برابـری ٢. دوستی ٣. همواری ۴. سرراستی

**ڕێكێشە / řêkêşe/**: ☜ **ڕكێشە**

**ڕێگا / řêga/**: نـاو. ڕێگە؛ ڕیەگە؛ ڕێ؛ ڕا؛ ڕێک: ١. بوارگەی هات‌وچـۆ و گواسـتنەوە (وەک شـەقام، جادە، هێڵـی ئاسـن و...) ‹ڕێگاكـەم دووره مەنزڵـم كوێسـتانە/ شـەو بـە سـەردا دێ یـار لـێم میوانـە «فولكلـۆر»› ٢. مـەودای پێـوان ‹ڕێگایـەكی زۆر چووم تا گەیشـتم› ٣. ڕێبـاز ‹هەركـە بـە ڕێگـای خۆی› ٤. /مەجاز/ شێواز؛ ڕەوشـتی كـار ‹ڕێگـای دەرس خوێندن ئەمـە نییـە!› ٥. بـەرایی؛ بـڕوایی ‹ڕێگایان نەئەدا بۆ ناو دێ، هەواڵـی ماڵـی كوێخـای ئەپرسی «مەسەل»› ☰ ١تا٣. راه ۴. شیوه ۵. اجازه

▣ **ڕێگای سەرڕاس**: ڕێگەیەک كە قـەمچ و پێچـی زۆری نییە و بە سانایی لەو ڕێگاوە ڕێبـوار بـە ئامانج دەگا ☰ راه سرراست

**ڕێگـای شیری**: كاكێشـانی ڕێگـای شـیری ☰ كهكشان راه شیری

▣ **ڕێگـا دان**: ڕێگە دان؛ بەرایی هاتنە شوێنی دان ☰ راه دادن

**ڕێگـا كردن**: ١. ڕێگـا دان بـۆ ڕۆیشـتن ٢. ڕێ دروست كردن ٣. ڕێگە چـوون ☰ ١. اجـازەی عبور دادن ٢. راه ساختن ٣. راه رفتن

**ڕێگایەک گرتن**: هەڵبژاردنی ڕێگایەک، بێ ئـاوڕ دانەوە پێوانی ‹لە دنیا لا ئەدەم ئەمجا، هەتا هەم ڕێی خوا ئـەگرم/ ڕەوشـتی سـۆفی و دەروێـش و تەكیە و خانەقا ئەگرم «مـوفتی پێنجـوێنی»› ☰ راهی را در پیش گرفتن

**ڕێگانە / řêgane/**: ناو. بەرایی؛ ئیجازە ☰ رُخصت

**ڕێگاوبـان / řêgawban/**: ☜ **ڕێ‌وبان**

**ڕێگـر / řêgir/**: نـاو. ڕاگـر؛ ڕێگـیر: ١. بـەرگر؛ كۆسپ؛ لەمپەر ٢. ڕابڕ؛ چەتە ‹وتی: كەرە گیـان! گوێ گرە/ ئەو دەنگە دەنگـی ڕێگـرە/ هـەتا زووە بـا بارت كەم/ لە ڕێگران ڕزگارت كەم «پەشێو»› ☰ ١. مانع ٢. راهزن

**ڕێگری** / řêg(i)rî/: ناو. جەردەیی؛ چەتەیی 🇮🇷 راهزنی

**ڕێگوزەر** / řêguzer/: ☜ **ڕارەو-١**

**ڕێگومکێ** / řêgumkê/: ☜ **ڕاگومکێ**

**ڕێگە** / řêge/: ناو. ☜ **ڕێگا**

◘ **ڕێگە خستن**: خستنە سەر ڕێ؛ ڕەوانە کردن 🇮🇷 راهی کردن

**ڕێگەچارە** / řêgeçare/: ناو. ڕێچار؛ دەرەتان؛ ڕێی لابردنی گرفت و کێشە 🇮🇷 راه حل

**ڕێگەدار** / řêgedar/: ئاوەڵناو. خاوەن ڕێگە؛ ڕێی تایبەتمەندی ئەوەی ڕێگە و جێگەی هەیە ‹ڕێگە بە ڕێگەدار نییە!› 🇮🇷 صاحبجا

**ڕێگەزان** / řêgezan/: ☜ **ڕێزان**[١]**-١**

**ڕێگەوان** / řêgewan/: ☜ **ڕێوان**

**ڕێگەوبان** / řêgewban/: ☜ **ڕێ‌وبان**

**ڕێگیر** / řêgîr/: ☜ **ڕێگر**

**ڕێل** / řêl/: ناو. ١. دارستان؛ لێڕ؛ لێڕەوار؛ جەنگەڵ ٢. ئاونگ؛ شەونم 🇮🇷 ١. جنگل ٢. شبنم

**ڕێلاس** / řêlas/: ☜ **ڕیلاس**

**ڕێلاندن** / řêlandin/: چاوگ. خستنە وەڕە؛ وە عەو ـ عەو خستن 🇮🇷 بە پارس واداشتن

**ڕێلی** / řêlî/: ناو. ١. میوە و بەری دارستان؛ بەری لێڕەوار ٢. گێوژ؛ گوێژ 🇮🇷 ١. میوەی جنگلی ٢. زالزالک

**ڕێلین** / řêlîn/: چاوگ. وەڕین؛ وەڕەوەڕ کردن 🇮🇷 پارس کردن

**ڕێلەخۆ** / řêłexo/: ☜ **ڕیخۆڵە-١**

**ڕێن** / řên/: ناو. ١. ڕان؛ مێگەل؛ گاگەل ٢. ڕدێن؛ ئەڕدێن؛ ریش 🇮🇷 ١. رمە؛ گلە ٢. ریش

**ڕێناس** / řênas/: ئاوەڵناو. ڕێزان؛ شارەزای ڕێ 🇮🇷 راە بلد

**ڕێناسی** / řênasî/: ناو. شارەزایی؛ بەڵەدی 🇮🇷 راەشناسی

**ڕێنامە** / řêname/: ناو. ١. بەرنامە؛ پەیڕەو ٢. نووسراوەیەک کە ڕێگەی شاران، مەودای نێوانیان و ئاگاداریی پێویستی تێدا نووسراوە 🇮🇷 ١. برنامە ٢. نقشەی راەها

**ڕێنج** / řênc/: ناو. ١. شوێن؛ ئاسەوار ٢. ڕەنج؛ لارە ٣. کرمی گیابڕ، بەڵای گیانی پەز و بزن 🇮🇷 ١. اثر؛ رد ٢. آزار؛ رنج ٣. کرم آفت احشام

**ڕێنجەبەر** / rênceber/: ☜ **ڕەنجبەر**

**ڕێنکە** / řênke/: ناو. ڕێنەکە؛ کار و ڕەوتی لێک کۆوە بوون و نەڕۆیشتن 🇮🇷 **عمل تجمع کردن و نرفتن**

◘ **ڕێنکە دان**: ١. لێک تۆپەڵ بوون و وێستان ٢. ڕێنەکە دان؛ زۆر ترسان و گرژ و مۆن بوون 🇮🇷 ١. تجمع کردن و نرفتن ٢. از ترس وا رفتن

**ڕێنما** / řên(i)ma/: ☜ **ڕێنوێن**

**ڕێنمایی** / řên(i)mayî/: ☜ **ڕێنوێنی**

**ڕێنوێن** / řên(i)wên/: ناو. ڕانما؛ ڕێنما؛ ڕێشاندەر 🇮🇷 راهنما

**ڕێنوێنی** / řên(i)wênî/: ناو. ڕێنمایی؛ ڕێشاندەری: ١. کاری ڕێ پیشان دان بە کەسێ بۆ گەیشتن بە شوێنی ویستراو ‹کوڕێک ئێمەی ڕێنمایی کرد بۆ ئێرە› ٢. کاری هەڵوەژارتن و بەڕێوە بردنی هاتوچۆی ئامێرگەلی ڕاگواستنەوە لە بوارگەکاندا ‹بەرپرسی ڕێنمایی› ٣. کار و ڕەوتی پیشاندانی شێوەی دروستی جێبەجێ کردنی کار یان کارگەلی تایبەت ‹بابم لە ژیندا زۆری ڕێنمایی کردووم›. هەروەها: **ڕێنوێنی کردن** 🇮🇷 ١تا٣. راهنمایی

**ڕێنووس** / řênûs/: ناو. دەستووری نووسین ‹ڕێنووسی لاتینی زمانی کوردی› 🇮🇷 رسم‌الخط

**ڕێ‌نەدراو** / řêned(i)raw/: ئاوەڵناو. قەدەغە؛ قاخە؛ قەدەخە؛ ناڕەوا 🇮🇷 ممنوع؛ قدغن

**ڕێنەکە** / řêneke/: ☜ **ڕێنکە**

**ڕێو / řêw/**: ناو. ١. ڕووی؛ تووکەبەر؛ مووی بەرگەدە ٢. تەڵەکە و فێڵ 🇮🇷 ١. موی زهار ٢. نیرنگ

**ڕێوار / řêwar/**: ☜ ڕێبوار

**ڕێواز / řêwaz/**: ☜ ڕێباز

**ڕێواس / řêwas/**: ناو. ڕیڤاس؛ ڕیڤاس؛ ڕێواو؛ ڕێواوی؛ ڕبێز؛ ڕبێس؛ ڕمبێز؛ ڕاوەند؛ ڕێوج؛ ڕێوچ؛ ڕمێز؛ نێز؛ زەڕنیلە؛ نێرتکی باسکلاو؛ نیرتکە گیایەکی ترش و ئاوداری کەمتەمەن، تایبەتی ناوچەی شێدار، کە دەگەڵ بەفر چوونەوە دەردەکەوێ و بە کاڵی و کوڵاوی دەخورێ 🇮🇷 ریواس

**ڕێواسی / řêwasî/**: ناو. مامڕێواس؛ گیایەکی باڵابڵندی ترشە دژی کرمی ناو زگە 🇮🇷 گیاهی داروی ضد جانور شکم

**ڕێواق / řêwaq/**: ناو. سپیایی ناو خورما کە وەک شیلەی هەنگوین پێکەوە نووساوە 🇮🇷 شهد خُرما

**ڕێوان / řêwan/**: ناو. ڕێدار؛ ڕەخدار؛ ڕێوان؛ ڕێرەڤان؛ ڕێگەوان؛ کەسێ کە چاودێریی ڕێگایەکی لە ئەستۆدایە 🇮🇷 راهدار

**ڕێوانی / řêwanî/**: ناو. ڕێگەوانی؛ فەرمانگەیێ کە چاودێریی و پاراستنی ڕێگاکانی وە ئەستۆیە 🇮🇷 راهداری

**ڕێواو / řêwaw/**: ☜ ڕێواس

**ڕێواوی / řêwawî/**: ☜ ڕێواس

**ڕێوبان / řêwban/**: ناو. ڕاوبان؛ ڕێگاوبان؛ ڕێگەوبان 🇮🇷 گذرگاه عمومی

▣ **مەزرینگەی ڕێوبان**: فەرمانگەی چاودێریی ڕێگاوبان 🇮🇷 ادارەی راه

**ڕێوبوار / řêwb(i)war/**: ☜ ڕێبوار

**ڕێوج / řêwic/**: ☜ ڕێواس

**ڕێوچ / řêwiç/**: ☜ ڕێواس

**ڕێوڕا / řêwřa/**: ناوەڵکار. ڕێوڕاست: ١. دەسبەجێ؛ لە ڕێوە؛ گورج ٢. ڕاستەڕێ 🇮🇷 ١. فوراً ٢. به خط مستقیم

**ڕێوڕاست / řêwřast/**: ☜ ڕێوڕا

**ڕێوڕەسم / řêwřesm/**: ☜ ڕێوشوێن ـ١

**ڕێوڕەوش / řê w řewiş/**: ناو. قام؛ کرگار؛ ئاکار 🇮🇷 روش

**ڕێوشوێن / řêwş(i)wên/**: ناو. ١. ڕێوڕەسم؛ گەلەمپەری؛ هۆرتە؛ ئایین و ئاهەنگی باوی ناو کۆمەڵ «ڕێوشوێنی بنەماڵەکەمان ئیجازەی نەدەدا من لەگەڵ هاوتەمەنەکانم گاڵتە و گەپ بکەم «هێمن»» ٢. دەستووری کار 🇮🇷 ١. راه و رسم ٢. طرح

▣ **ڕێوشوێن گرتنە بەر**: خستنە ناو دەستووری کار 🇮🇷 اجرایی کردن

**ڕێوگار / řêwgar/**: ☜ ڕێبوار

**ڕێونای / řêwnay/**: چاوگ. بزڕکاندن 🇮🇷 بریدن لبنیات

**ڕێونگ / řêwing/**: ☜ ڕێبوار

**ڕێوی[1] / řêwî/**: ناو. ١. ڕێوی؛ ڕتۆپی؛ ڕواس؛ ڕواسە؛ ڕوا؛ ڕوڤی؛ ڕۆڤی؛ رووڤی؛ ڕەواسە؛ ڕێڤی؛ چتر؛ گیانداری گواندار لە بەرەی سەگ، بە پێی کورت، جەستەی درێژ، گوێی زل، قەپۆزی باریک، کلکی درێژی کولکن و بڕێکیان بە کەولی خەزەوە ٢. ڕدێن؛ ئەردێن؛ ڕیش ٣. ڕێبوار 🇮🇷 ١. روباه ٢. ریش ٣. رهگذر

▣ **ڕێوی کرن**: ڕژاندن 🇮🇷 ریختن

**ڕێوی[2]**: ئاوەڵناو. بەڕێ؛ ڕاواز؛ ڕوونیا؛ لە ڕۆیشتندا 🇮🇷 راهی

▣ **ڕێوی کرن**: بەڕێ کردن 🇮🇷 راهی کردن

**ڕێویای / řêwyay/**: چاوگ. بڕسکان؛ بزڕکان 🇮🇷 بریدن لبنیات

**ڕێوینگ / řêwîng/**: ناو. ١. ڕان؛ مێگەل ٢. ☜ ڕێبوار 🇮🇷 ١. گله؛ رمه ٢. ☜ ڕێبوار

# ز

**ز** / z/: پــت. نیشـــانەی پـــیتی ســـێزدەهەمی ئەلفوبێی زمانی کوردی ■ ز؛ نشانەی سیزدهمین حرف الفبای کُردی

**ز**[1] / zi/: نـاو. ناوی پیتی سێزدەهەمی ئـەلفوبێـی زمانی کوردی ■ ز؛ سیزدهمین حرف الفبای کُردی

**ز**[2]: ئامراز. ١. لە؛ جە؛ ژ؛ ژێ ٢. بە؛ پیتی بادانـەوە/ پێوەند ■ ١. از ٢. حرف عطف/ ربط

**زا**[1] / za/: نـاو. ١. زار؛ منـداڵ؛ بێچـوو ‹زای وارزای؛ ژن و زا› ٢. ڕەوتی زان ‹زگ و زا› ٣. بـــــــەرە؛ بێچووی مەڕ و بزن ‹زا و مـاک تێکـەڵ کـراوە› ٤. زەواد؛ خۆراک؛ تۆشە ٥. نۆبە لە قوماردا ‹زا بـرن› ■ ١. زاد؛ فرزند ٢. زاد؛ زایش ٣. بچەی گوسفند و بُـز ۴. توشە ۵. نوبت در قمار

■ **زای ئاسن**: مـــووروی ئاســـن؛ ســـولفاتی دوو بەرامبەرکراوەی ئاسـن و پوتاسـیوم، مـاکێکی نەگۆڕی وەنەوشە کە لە ئاودا دەتوێتەوە ■ زاج آهن

**زای باتی زای**: نەوەی برای باوک؛ نەوەی مام ■ نوەی عمو

**زای برازازای**: نەوەی برا ■ نوەی برادر

**زای خالی زای**: خاڵۆزازا؛ نەوەی بـرای دایـک ■ نوەی دایی

**زای عەم زای**: نەوەی خوشـکی بـاوک ■ نـوەی عمّە

**زای وارزای**: نەوەی خوشک؛ خوشکەزازا ■ نوەی خواهر

**زای یایک زای**: نەوەی خوشکی دایـک ■ نـوەی خالە

■ **زا برن**: بردنەوەی قومار ■ بردن در قمار

**زا دۆڕان**: دانانی قومار ■ باختن در قمار

**زا**[2]: ئاوەڵناو. وشک؛ زوها؛ زوا ■ خُشک

**زا**[3]: ئاوەڵکار. سا؛ کەوایە؛ دەیسا ‹زا وەرە› ■ پـس؛ بنابراین

**زا**[4]: جێناو. زاد؛ چ؛ هیچ؛ هیچێک ‹تـام زای نـەکرد؛ زای نەهێشت، گشتی خوارد!› ■ هیچ

▪ **زا**[5]: پاشەوشـە. ١. منداڵ ‹برازا؛ ئـامۆزا› ٢. زاد؛ زاو؛ لە دایک بـوو؛ سەرهەڵـداو ‹نـووزا› ٣. بـەدیهێن ‹زیندەزا› ٤. ـ زان؛ بـزان ‹شـارەزا› ■ ١و ٢. ـ زاد ٣. ـ زا ۴. ـ دان

**زاب** / zab/: ناو. ١. سەکۆ؛ دەکە؛ ڕووبەرێکی تەخت بۆ لە سەر دانیشتن ٢. نۆبـە؛ نـۆرە؛ سـەرە ٣. ☜ شاپ ـ٥ ■ ١. سکو ٢. نوبت ٣. ☜ شاپ ـ٥

**زابت** / zabit/: ناو. زابوت؛ زافت؛ ئەفسەر ■ افسر

**زابلۆق** / zabloq/: نـاو. ڕیخۆڵـەی ئەسـتوور ■ رودەی بزرگ

**زابوت** / zabut/: ☜ زابت

**زابوق / zabuq/:** ناو. زڤل؛ سەرانگویلک؛ سەریوان؛ گووفک؛ پاکوت 🇮🇷 جای ریختن سرگین

**زابۆق / zaboq/:** ناو. ئاودڕ؛ دادڕاوی لافاو 🇮🇷 درّەی مسیل باران

**زابەند / zabend/:** ناو. دەفتەری ناو نووسینی تازەزاوان 🇮🇷 دفتر موالید

**زاپ / zap/:** ناو. ١. لکی چۆم؛ لق لە چەم ٢. سواپ؛ چەوی پان و لووس و ناسک کە منال گەمەی پێ دەکەن 🇮🇷 ١. انشعاب نهر ٢. شن صاف

**زاپاس / zapas/:** ناوەڵناو. سپێر؛ یەدەک؛ جێگر (بۆ ئامێر) 🇮🇷 زاپاس

**زاپان / zapan/:** ناو. زاپێن؛ سواپێن؛ گەمە بە زاپ 🇮🇷 بازی با «زاپ»

**زاپێن / zapên/:** ☜ **زاپان**

**زات / zat/:** ناو. ١. هەبوونی ‹هەتا کەنگێ دەدەی تۆ بەخت و هاتی/ دەزانی چەند درە، نەحلەت لە زاتی! «هێمن»› ٢. بوێری؛ ئازایی ‹مەلا مستەفا زۆر ڕقی لە کەسێک دەهات کە بلێن ئارەق دەخواتەوە و کەس زاتی نەبوو لە شۆرشدا بخواتەوە «هەژار، چێشتی مجێور»› ٣. *[کۆن]* کەسایەتی؛ شەخسی مەزن و هێژا ‹تەمی غەم تا قیامەت بۆچی دانەگرێ وڵاتی کورد/ کە زاتێکی وەفادار و نەجیب و خانەدان ڕۆیی «بێخود»› 🇮🇷 ١. وجود؛ ذات ٢. زَهره؛ جُرأت ٣. شخصیت؛ مقام

◘ **زات بردن:** ترساندن؛ ترسانن 🇮🇷 ترساندن

**زات بون/ نەبون:** وێران؛ نەترسان ‹زاتت هەیە بیدوێنە› 🇮🇷 جرأت داشتن

**زات چون:** ترسان؛ ترسیان 🇮🇷 ترسیدن

**زات شکان:** وێران و ترس لە لا نەمان 🇮🇷 ترس ریختن

**زات کردن:** وێران؛ نەترسان 🇮🇷 جرأت کردن

**زاتئاو / zat'aw/:** ☜ **زاتاو**

**زاتاو / zataw/:** ناو. زاتئاو؛ ئاوی زراو 🇮🇷 صفرا

**زاتبەر / zatber/:** ئاوەڵناو. ترسهێنەر؛ سامناک؛ نەتڵ 🇮🇷 ترسناک

**زاتدار / zatdar/:** ئاوەڵناو. بەزات؛ ئازا؛ نەترس 🇮🇷 شُجاع

**زاتۆرە / zatore/:** ناو. زاتیل؛ تۆرەمە 🇮🇷 نوه و نبیره

**زاتەن / zaten/:** ئاوەڵکار. هۆرا؛ لە خۆیدا 🇮🇷 اساساً؛ ذاتاً

**زاتەنە / zatene/:** چاوگ. زەڕینی کەر 🇮🇷 عرعر کشیدن

**زاتیک / zatîk/:** ناو. جێژنێکی هەرمەنیانە 🇮🇷 از اعیاد ارمنیان

**زاتیل / zatîl/:** ☜ **زاتۆرە**

**زاج / zac/:** ناو. ١. کاکۆلی منال ٢. ☜ **زاخ -٢** 🇮🇷 ١. کاکُل بچه ٢. ☜ **زاخ-٢**

**زاجلانەی / zaclaney/:** ☜ **زاجلانی**

**زاجلانی / zaclanî/:** ناو. زاجلانەی؛ هەوەڵ ژانی ژن لە سەر و بەندی زارۆ هێناندا 🇮🇷 اوّلین درد زایمان

**زاج و پەرچەم / zac û perçem/:** ناو. کاکۆل و مووی ناوچاوانی منال 🇮🇷 کاکُل و موی پیشانی کودک

**زاچ / zaç/:** ناو. ژنی زەیستان 🇮🇷 زائو

**زاخ / zax/:** ناو. ١. ☜ **زاخە** ٢. زاج؛ زاگ؛ زای؛ شەب؛ ساچ؛ خوێی ئالومینیومداری ئەسید سوولفوریک، کە گەردێکی سپی، بێبۆن و تفتە، بۆ پالاوتنی ئاو و چەرمسازی بە کار دێ ٣. شاخ؛ گاشە؛ تاش ٤. دنە؛ هانە ٥. جەوهەری تیخی خەنجەر و شمشێر ٦. هێڵ؛ خەت 🇮🇷 ١. ☜ **زاخە** ٢. زاج ٣. صخره ۴. تشجیع ۵. پرند ۶. خط

**زاخان / zaxan/:** ناو. بەردەلانی زۆر چەتوون 🇮🇷 سنگلاخ دشوارگُذر

**زاخاو / zaxaw/:** ناو. زاخجۆش؛ زاخی تواوە کە بۆ قایم کردنەوەی شتی لەق بە کار دێ 🇮🇷 زکاب

⊡ **زاخاو بۆ کەسێ تاواندنەوە:** [کینایە] گێچەڵ بۆ کەسێ ساز کردن؛ مەینەت و ڕەنج دانی کەسێک ⯀ کسی را نقرەداغ کردن

**زاخاو دان:** زاخاو دانەوە: ١. جۆش کردن بە زاخ ٢. جەلا دان؛ درەوشاوە کردن ٣. [کینایە] سەفا دان؛ پاک و پوختە کردن (بە هەستی کوردایەتی مێشکمی زاخاو دا) ٤. [مەجاز] خۆش ڕابواردن؛ تەخت کردنی کەیف ⯀ ١. پیوند دادن با زکاب ٢. جلا دادن ٣. صفا دادن ٤. خوش گذشتن

**زاخاو دانەوە:** ١. ☜ **زاخاو دان** ٢. پاک کردنەوەی خشڵی زێڕ و زیو بە شێوەی تایبەت لە زێڕینگەریدا ٣. جەوهەر دانی تێخی شیر و خنجەر ⯀ ١. ☜ **زاخاو دان** ٢. تمیز کردن جواهرات ٣. جوهر دادن تیغ

**زاخاو دانی چاو:** بە کەیفی دڵ تەماشای دیمەنێکی دڵڕفێن یان هەر شتێکی جوان کردن ⯀ دیده را جلا دادن

**زاخجۆش** / zaxcoş/: ☜ **زاخاو**

⊡ **زاخجۆش کردن:** کفاندن و جۆش کردن بە زاخ ⯀ جوش زدن با زاج

**زاخدار** / zaxdar/: ناو. ١. تیخی جەوهەردار ٢. [مەجاز] هونەرمەند ⯀ ١. تیغ جوهردار ٢. هنرمند

**زاخدراو** / zaxd(i)raw/: ئاوەڵناو. گاودراو بە زاخ؛ قایمکراو بە زاخ ⯀ چسبانده شده با زاج

**زاخر** / zaxir/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **زاخڕ** ٢. [کینایە] زۆر سارد ⯀ ١. ☜ **زاخڕ** ٢. بسیار سرد

**زاخرخانە** / zaxirxane/: ناو. ١. ☜ **زاخە** ٢. [کینایە] ژووری زۆر سارد ⯀ ١. ☜ **زاخە** ٢. اتاق بسیار سرد

**زاخڕ** / zaxiř/: ناو. زاخێڕ؛ زاخر: ١. زاغوڕ؛ لێژی (نەک چوون سەفای کەیف سیاوان/ سمکۆی سەر زاخڕ نە پای بەفراوان «مەولەوی») ٢. زاخە ⯀ ١. شیب سنگلاخی ٢. زاغه

**زاخوڕ** / zaxuř/: ☜ **ڕەهۆڵ**

**زاخۆر** / zaxor/: ناو. ١. بەردەلانی ڕژد و بڵند ٢. ئەشکەوت لە کێودا ⯀ ١. صخره ٢. غار

**زاخۆران**[1] / zaxoran/: ناو. تالان و بڕۆ ⯀ غارت و چپاول

**زاخۆران**[2]: ئاوەڵناو. تێرنەخۆر؛ فرەخوەر ⯀ پُرخور

**زاخۆرانباخۆران** / zaxoranbaxoran/: ئاوەڵکار. کەس‌لەکەس؛ بێ خاوەن؛ زۆردار و بێ زۆر ⯀ هرکی ـ هرکی

**زاخۆری** / zaxorî/: ناو. پارچەیەکی لە ئاوریشم ژنان دەیکەنە لەچک ⯀ پارچەی ابریشمی

**زاخۆن** / zaxon/: ☜ **زاخە**

**زاخوور** / zaxûr/: ☜ **زاخە**

**زاخە** / zaxe/: ناو. زاخ؛ زاخڕ؛ زاخۆن؛ زاخێڕ؛ زاخۆر؛ زاخوور؛ زاخرخانە؛ کەوێل؛ کوول؛ کوێل؛ تەوخ؛ ڕەهۆڵ؛ سولتان؛ تەمووشە؛ گورە؛ ئەشکەوتی دەسکرد لە کێو، تەپۆلکە یان ڕەتیمدا، بۆ هەڵگرتنی شتێ یان تێدا مانەوە ⯀ زاغه

**زاخەبەرد** / zaxeberd/: ناو. بەردی ئالوم؛ سولفاتی ئاوداری ئالومینیوم، بریتی لە پوتاس، ئالومین و جارجار هێندێک سودیوم کە لە بەردە گڕکانییەکاندا بەدی دەکرێ ⯀ زاجسنگ؛ سنگ آلوم

**زاخەکەن** / zaxeken/: ناو. کەندەسمە ⯀ زنبورخوار

**زاخێ** / zaxê/: ناو. قشقەڕە؛ قاژوو ⯀ زاغی

**زاخێڕ** / zaxêř/: ☜ **زاخڕ**

**زاخێز** / zaxêz/: ناو. خیزەلان؛ زیخەلان ⯀ شنزار

**زاد**[1] / zad/: ناو. ١. توێشوو (تاقە خانێکە لە سەر ڕێی ئاخیرەت/ زادی ڕێ هەڵناگرێ لەم خانە بۆچ؟! «مەحوی») ٢. نان و دەخڵ (ئیڤارێ تەعام و زاد ژ بۆ شێخ بەگێ ڤ ڕێ دکەن) ٣. ڕەوتی منال پەیا

بوون ■ ١. توشه ٢. نان و غله ٣. زايش

**زاد**[٢]: ☜ **زا**[٤]

**زادپـــەیزاد** / zadpeyzad/: نـــاو. پشتاوپشـــــت؛ جەداوجەد ■ جداندرجد

**زاددان** / zaddan/: ناو. توێشوودان ■ توشەدان

**زادووەڵـەد** / zad û weľed/: ناو. زادووەڵەند؛ زک و زا؛ زگ و زا؛ ڕەوتی بێچـــوو هێنـــان و تۆرەمـــە خستنەوە ■ زادوولد

**زادووەڵەند** / zad û weľend/: ☜ **زاد و وەڵەد**

**ـ زاده** / zade-/: پاشەوشـە. ـــ زايـــە؛ ـ زا؛ منـــداڵ ‹نەجیبزادە› ■ ـ زاده

**زادەگا** / zadega/: ناو. بانەگا؛ بەرگەدە ■ شـرمگاه؛ زهار

**زار**[١] / zar/: نـاو. ١. منـاڵ؛ منـداڵ ‹زار و زێـچ› ٢. دەم؛ دەڤ ‹چوار دانە ڕۆژ زەوادم نـەچووە سـەر زار. وام لێ هاتبوو لە ڕێ کردندا لینگم دەلەرزی! «هەژار، چێشتی مجێور»› ٣. ژار؛ ژەهر؛ سـەم ٤. مـۆرەی تەختەنەرد ٥. *[مەجاز]* زمان ‹ئەو زڕکوڕەکانیشـتانی نەکردۆتە کوڕی ئێوە و ئەمە هەر قسەی خۆتانە و هەر لە زاری خۆتانـەوە داکـەوتووە «هـەژار، *قورئـان*»› ٦. هەر یەکـە لـە جۆرەکـانی زمانـێ کـە بـە وشـە، ڕێزمان و ڕاوێژ لە لقەکانیتـری ئـەو زمانـە جیـا دەبێتـەوە و لـەخۆگری چەنـد شـێوەزارە ‹زاری کرمانجی› ٧. قسە؛ وتە؛ گوتە؛ گفت ‹بە تاقەیـەک زاری شیرین/ شاخ پڕ ئەکا لە پێکەنین «گۆران»› ٨. گۆرانی؛ سـتران ‹زار گـوتن› ٩. تووکـە بـەر ١٠. زارە؛ زراو؛ زات ‹زار چوون› ١١. گریـان؛ شـیوەن ■ ١. کودک ٢. دهان ٣. سَم ٤. مُهرەی نَرد ٥. لهجه ۶. گویش ٧. سُخن ٨. ترانه ٩. موی زهار ١٠. زَهـره؛ جُرأت ١١. زاری

◘ **زار گۆتن:** ستران گوتن؛ گـۆرانی گـوتن ■ آواز خواندن

**زار چـوون:** زارە چـوون؛ تۆقـان؛ زۆر ترسـان ■ زهرەترک شدن

**زار**[٢]: ئاوەڵناو. ١. کەمهێز؛ کز و لاواز ‹خەت و خـاڵ و زولف و برژۆڵ لە نزیکی چاوی مەستە/ هەموو زار و جەستەخەسـتە، هـەموو شـێت و دەسـتبەسـتە «ئاوات»› ٢. پەرێشان و لێقـەوماو ‹سـەبا! یـارانی مەجلیس گەر دەپرسن حالی زارم لێت/ بڵێ کێشایە مەیخانە دوو چاوی بێچوەعەییارێک «مستەفا بەگ»› ■ ١. ضعیف ٢. پریشان

**ـ زار**[٣]: پاشگر. ـ جاڕ؛ شـوێنی ڕوان یـان هـەبوونی شتێک بە فراوانی ‹گوڵزار› ■ ـ زار

**زار**[٤]: پێرۆ. ← **زەویوزار**

**زارا** / zara/: ناو. زارانج؛ زارانجە؛ زارانز؛ ژەرەژ؛ کەو ■ کبک

**زاراخن** / zaraxin/: ☜ **زارەوانە**

**زاراڤ** / zarav/: ☜ **زاراوە**

**زاران** / zaran/: ئاوەڵکار. گوایـە؛ چمـا؛ چمـان ■ گویا

**زارانج** / zaranc/: ☜ **زارا**

**زارانجە** / zarance/: ☜ **زارا**

**زارانز** / zaranz/: ☜ **زارا**

**زاراو** / zaraw/: نـاو. ١. ☜ **زاراوە ـ١و٢** ٢. ژاراو؛ دەرمانی تراوی گیانلەبەرکوژ ٣. *[کینایە]* میز؛ مێز؛ گمێز ■ ١. ☜ **زاراوە ـ١و٢** ٢. زهرابـه ٣. شـاش؛ ادرار

**زاراوە** / zarawe/: نـاو. زاراڤ: ١. زاراو؛ چۆنیـەتی وتـنی وشـەی زمانێـک بـە شـێوەی ئاخـاوتنی زمانێکیتر ‹کوردی بە زاراوەی فارسی قسە دەکرد› ٢. زاراو؛ دەراو؛ شێوەی قسـە کـردنی تـاقمێکی کـــاری یـــان کۆمەڵایـــەتی ‹زاراوەی وەک نەخوێندەواران وا بوو› ٣. دەستەواژە؛ لاهنا؛ لانـاو؛ وشـە یـان ڕسـتەیەک کـە لـە نـاو دەسـتەیەکی دیـاریکراو یـان لـە زانسـت، هونـەر، کـار یـان پیشەیەکدا، خاوەن واتایەکی تایبـەتی و جیاکـارە

☰ ١و٢. لهجه ٣. اصطلاح

**زاربلاو / zarb(i)ław/:** ☜ **زمان‌شڕ**

**زاربوغازه / zarbuğaze/:** ناو. شەلەگەی دێراو؛ ئەو شوێنە ئاوی لێوە دەچێتە ناو کەردوو ☰ دریچەی ورودی جوی

**زاربەزار / zarbezar/:** ئاوەڵکار. دەڤ‌بەدەڤ؛ دەماودەم ☰ دهن‌به‌دهن

**زاربەست / zarbest/:** ناو. ١. دەمامک؛ دەم‌هەڵپێچ ٢. دەمبێن؛ سنۆک ٣. ☜ **زاربێتە** ☰ ١. دهان‌بند ٢. پوزەبند ٣. ☜ **زاربێتە**

**زاربەستو / zarbestû/:** ☜ **زاربەستە**

**زاربەستە / zabeste/:** ئاوەڵناو. زاربەستوو؛ بەستەزمان؛ دەم‌بەسراو ☰ دهان‌بسته

**زاربێن / zarbên/:** ☜ **زاربێتە**

**زاربێنک / zarbênik/:** ☜ **زاربێتە**

**زاربێنە / zarbêne/:** ناو. زاربەست؛ زاربێن؛ زاربێنک؛ زارکەبێنە؛ زارەمبێن؛ تۆپەوانە؛ شتێک لە دار یان پەڕۆ بۆ زارکی جەڕە و گۆزە ئاخنین ☰ دهانه‌بند

**زارتر / zartir/:** ناو. کەو ☰ کبک

**زارجو / zarcû/:** ناو. دەمەجاو؛ دەمێ جاچکە؛ ئەندازەیەک بنێشت بۆ جاوین ☰ اندازه‌ای مناسب از آدامس برای جویدن

**زارچکە / zarç(i)ke/:** ناو. بنێشت؛ جاچکە؛ داچکە؛ جاجکە ☰ آدامس

**زارچن / zarçin/:** ناو. بژارچن؛ ئامێری بچووکی بژار کردن ☰ ابزار وجین

**زارخوار / zarx(i)war/:** ئاوەڵناو. دەڤ‌خوار؛ دەم‌چەوت ☰ کج‌دهن

**زارخۆش[1] / zarxoş/:** ئاوەڵناو. *[مەجاز]* گفت‌خۆش؛ لفت‌ڕەوان؛ دەم‌وڕاوێژخۆش ☰ شیرین‌زبان

**زارخۆش[2]:** سارستە. دەم‌خۆش؛ ئافەرین بۆ قسەت ☰ گُل گُفتی

**زارخەن / zarxen/:** ناو. زارخەنە؛ زەهرخەنە؛ خەندەی تاڵ؛ کاری پێکەنین لە ناڕەحەتیان ☰ زهرخند

**زارخەنە / zarxene/:** ☜ **زارخەن**

**زاردڕاو / zard(i)řaw/:** ☜ **زمان‌شڕ**

**زاردەشت / zardeşt/:** ئاوەڵناو. ڕاست‌بێژ؛ ڕاس‌وێژ ☰ راستگو

**زارزار / zarzar/:** ئاوەڵناو. لاسار؛ پێ‌داگر؛ گوێ‌نەدەر ☰ لجوج

**زارزارک / zarzarik/:** ناو. دەمەلاسکە ☰ تقلید

**زارزانک / zarzanik/:** ناو. شانۆکار: ١. ئەکتەری شانۆ ٢. دەرهێنەری شانۆ ☰ ١. بازیگر تأتر ٢. کارگردان تأتر

**زارزل / zarzil/:** ئاوەڵناو. گووپ‌گوشاد؛ کیف‌دەم ☰ دهن‌گُشاد

**زارزیچ / zarzîç/:** ☜ **زاروزیچ**

**زارشڕ / zarşiř/:** ☜ **زمان‌شڕ**

**زارڤە / zarve/:** ناو. ١. دەمەلاسکە؛ لاسایی ٢. کاری زمان دەرێنان بۆ گاڵتە پێ‌کردن ☰ ١. تقلید ٢. عمل زبان به تمسخر درآوردن

**زارک / zarik/:** ناو. دەم؛ زار (بۆ هەموو شت جگە لە گیاندار) ‹زارکی مەشکە؛ زارکی ئەشکەوت› ☰ دهانه

**زارکەبێنە / zarkebêne/:** ☜ **زاربێتە**

**زارگا / zarga/:** ناو. زارەگا؛ بەرگەدە؛ جێگەی تووکەبەر لێ ڕوان ☰ زهار

**زارنجە / zarince/:** ☜ **زەرەج**

**زارنەرم / zarnerm/:** ئاوەڵناو. *[مەجاز]* زمان‌لووس؛ دەم‌تەڕ ☰ چرب‌زبان

**زاروانە / zar(i)wane/:** ئاوەڵناو. زارۆڵانە؛ منالانە ☰ بچه‌گانه

**زاروزوار / zar û z(i)war/:** ☜ **زاروزویر**

**زاروزویر / zar û z(i)wîr/:** ئاوەڵناو. زاروزوار؛ زاروزوێر؛ زاروزوێن؛ زارونزار؛ کز و کەنفت ☰ زار و

نزار

**زاروزوێر** / zar û z(i)wêr/: ☜ **زاروزویر**

**زاروزوێن** / zar û z(i)wên/: ☜ **زاروزویر**

**زاروزیچ** / zar û zîç/: ☜ **زاروزێچ**

**زاروزێـچ** / zar û zêç/: نـاو. زاروزیـچ؛ زارزیـچ؛ زاڤوزیچ؛ زاڤوزێچ؛ زاوزیچ؛ زایا؛ زێر و زیچ؛ زەو و زوو؛ زێ و زا؛ وەچ و بەرە؛ زازا؛ کوڕەزا و کچـەزا و هەموو ئەوانەی کـە لـە کەسێکەوە بـەدیهاتوون ‹ئەی زاروزێچی ئیسرائیل! بیر لەو چاکە بکەنەوە کـە من دەربارەتانم کرد «هەژار، *قورئان*»› ☰ زادورود

**زاروزێن** / zar û zên/: ☜ **زاروزویر**

**زارونزار** / zar û n(i)zar/: ☜ **زاروزویر**

**زارۆ** / zaro/: نـاو. زارۆک؛ زارۆلـە؛ زاولـە؛ زاورۆ؛ زاوەرە: ١. فرزەند ٢. منالی چکۆلە ☰ ١. فرزند ٢. کودک

**زارۆتی** / zarotî/: ☜ **زارۆکی**

**زارۆک** / zarok/: ☜ **زارۆ**

**زارۆکی** / zarokî/: ناو. زارۆتی؛ ڕۆژگاری منداڵی ☰ دوران کودکی

**زارۆکێتـی** / zarokêtî/: نـاو. گـەدەیی؛ ڕۆژگـاری منداڵی ☰ دوران کودکی

**زارۆڵانە** / zarołane/: ☜ **زاروانە**

**زارۆڵە** / zarołe/: ☜ **زارۆ**

**زارۆڵـەیی** / zarołeyî/: نـاو. زاولـەیی؛ منالـی ☰ بچگی

**زارو** / zarû/: ناو. ١. زالۆ؛ زالوو؛ زالـە؛ زالی؛ زالـی؛ زالوو؛ زەروو؛ زەلوو؛ زیـرۆ؛ زێـروو؛ زێـرق؛ زێلـوو؛ کرمـی گچکـەی ئالـقەیی کـە زۆرتـر دە ئـاوی شـــیریندا دەژی و بـــە یارمـــەتی ئەنـــدامانی مژۆکییـــەوە دەزەلقێتـــە گیانـــەوەران و خوێنیـــان هەڵدەمژێ ٢. زارۆ؛ منال ☰ ١. زالو ٢. کودک؛ بچه

**زارە** / zare/: ناو. ١. گەنمـەکوتاو ٢. ☜ **زراو**[1] ٣. زار؛ مووی بەرگەدە ☰ ١. گندم نـیم‌کوبیـده ٢. ☜ **زراو**[1] ٣. موی زهار

▣ **زارە چـوون**: زارەتـرەک بـوون؛ زۆر ترسـان ☰ زهره‌ترک شدن

**زارەترەک** / zaret(i)rek/: ☜ **زاڵەترەك**

**زارەچوو** / zareçû/: ☜ **زاڵەترەك**

**زارەزار** / zarezar/: دەنگـەناو. زۆڕەزۆڕ؛ دەنگـــی گریانی بێ‌بڕانەوە ☰ زار- زار

**زارەکی** / zarekî/: ئاوەڵناو. زوانی؛ زمانی؛ دەمی؛ بە گوتە ‹وێژەی زارەکی› ☰ شفاهی

**زارەگا** / zarega/: ناو. ١. ☜ **زارگا** ٢. گیابالووکە؛ گولـــەئاوات؛ گولـــەئاخ؛ گوڵەشـــفا؛ مەخەلەســـە؛ گیایەکی ڕازێنـەری بـە گوڵـی سـوور، ئـاڵ یـان سپییەوە ☰ ١. ☜ **زارگا** ٢. گل میمون

**زارەمبێن** / zarembên/: ☜ **زاربێنە**

**زارەوانـە** / zarewane/: نـاو. زاراخـن؛ دەمەڵـبێن؛ تۆپەڵـە پـەڕۆ یـان دار کـە دە دەمـی دەفـری ڕادەکەن ☰ دهانه‌بند ظرف از گلوله‌ی وصله یا چوب

**زارەودەر** / zarewder/: نـاو. ١. دەرگـای ژوورێـک کە بەرەو کۆڵان بکرێتەوە ٢. سەر تەندووری بـەر ئاوەڵا ٣. جێگای گوللە یان برینی دیواودیو ☰ ١. دری کە رو بـە کوچـه بـاز شـود ٢. سـر تنـوری کـه جلویش باز است ٣. جای گلوله یا زخم دوطرفه

**زارهەژدیها** / zarhejdîha/: نـاو. گیای دەمەشێر ☰ گیاهی است

**زاری** / zarî/: ناو. ١. گریـان و شـیوەن ٢. زارۆلـە؛ منال ☰ ١. زاری ٢. کودک

**زاریـان** / zaryan/: چـاوگ. زاریـــن؛ گریـــانی بـــە دەنگی بەرز؛ شین و شەپۆڕ کردن ☰ زار زدن

**زارین** / zarîn/: ☜ **زاریان**

**زارێک** / zarêk/: ئاوەڵکار. دەمێ؛ دەمێک ☰ دهنی

**زاڕۆ** / zařo/: ناو. فرزەند؛ ڕۆڵە؛ بێچوو ☰ فرزند

**زاز** / zaz/: نـاو. ١. ☜ **ساز**[1]**-١** ٢. زا؛ نـەوە ☰ ١. ☜ **ساز**[1]**-١** ٢. نوه

**زازا** / zaza/: ناو. ١. نـەوە و نەتـەوە ٢. لـە شـێوە زارەکانی زمـانی کـوردی ⇐ ١. نـوه و نبیـره ٢. از گویش‌های زبان کردی

**زاغ** / zağ/: ناو. کێڕ؛ خەتی درێـژی ئاسـۆیی یـان ئەستوونی بۆ نێوانی مەبەست ⇐ خطوط افقی یـا عمودی در خط‌کشی

**زاغـور** / zağur/: نـاو. خــەتکێش؛ خەتکــەش ⇐ خط‌کش

**زاغوڕ** / zağuř/: ☜ زاخڕ-١

**زاغـوور** / zağûr/: ناو. هێڵینگ؛ ڕاستە؛ خـەتکێش؛ کرکەش؛ مەستەرە؛ ئامرازێکی تەخت و باریک لە چێو، لاستیک یان کانزا، بۆ کێشانی هێڵی ڕێک و پێوانی درێژایی هێڵێک ⇐ خط‌کش

**زاف** / zaf/: ئاوەڵـناو. زاف؛ زەهف؛ زەحف؛ پـڕ؛ زۆر؛ زیاد؛ زێدە ⇐ بسیار

▣ **زاف راتـایی:** زاف راتــانی؛ ڕەوتی زۆر کـــەم بوونەوە ⇐ فرایند بسیار کم شدن

▣ **زاف بیایش:** زاف بوون ⇐ زیاد شدن

**زاف کەردش:** زیاد کـردن؛ زێـدە کـردن ⇐ زیـاد کردن؛ افزودن

**زافت** / zafit/: ☜ زابت

**زافران** / zaf(i)ran/: ☜ زەعفەران

**زافرانی** / zaf(i)ranî/: ☜ زەعفەرانی

**زافنەمەند** / zafnemend/: ئاوەڵناو. کەم‌کـردوو ⇐ کاستە

**زافەران** / zaferan/: ☜ زەعفەران

**زافەرانی** / zaferanî/: ☜ زەعفەرانی

**زافەوەر** / zafewer/: ناو. زەیسان ⇐ زائو

**زافەی** / zafey/: ☜ زافی

**زافی** / zafî/: نـاو. زافـەی؛ زاڤـەی؛ زاڤـی؛ زۆری؛ فرەیی؛ زیادی؛ زێدەیی ⇐ فراوانی

**زاڤ**[1] / zav/: نـاو. ١. زاوە؛ سـاوە؛ نزیکتـرین ئەسـتێرۆک بـە هـەتاوەوە ٢. ڕێ‌وڕەسـم ⇐ ١. عطارد ٢. راەورسم

**زاڤ**[2]: ☜ زاف

▣ **زاڤ راتانی:** ☜ زاف راتایی

**زاڤا** / zava/: ☜ زاوا

**زاڤابەندی** / zavabendî/: ☜ زاوابەندی

**زاڤانی** / zavanî/: ناو. پەردە؛ شـەوی چـوونی زاوا بۆ لای بووک ⇐ زفاف

**زاڤدان** / zavdan/: ناو. منداڵدان ⇐ زهدان؛ رحم

**زاڤر** / zavir/: ☜ زراو[1]-٢

**زاڤزاڤ** / zavzav/: ئاوەڵناو. زۆر زیاد؛ فرە - فـرە ⇐ بسیار زیاد

**زاڤوزیچ** / zav û zîç/: ☜ زاروزێچ

**زاڤوزێچ** / zav û zêç/: ☜ زاروزێچ

**زاڤەی** / zavey/: ☜ زافی

**زاڤی** / zavî/: ☜ زافی

**زاڤێر** / zavêr/: ☜ زاوێر

**زاق**[1] / zaq/: ناو. ١. قەلەڕەشە ٢. شـینی کـاڵ ٣. چۆنیەتی تۆقین لە ترسان ٤. مـاق؛ واق؛ دۆخـی چاو برینـە شـتێ بـۆ ماوەیـەک ⇐ ١. زاغ ٢. آبـی روشن ٣. زهرەترک ٤. زُل

▣ **زاق بوونەوە:** زاق - زاق ڕوانین؛ زل - زل ڕوانین؛ چاو تێبڕین؛ بە پێداگری و سەرنجەوە ڕوانین و چاو هەڵنەگرتن ⇐ زُل زدن

**زاق - زاق ڕوانین:** ☜ زاق بوونەوە

**زاق**[2]: ئاوەڵناو. [پلار] ١. قیت؛ زەق؛ زۆپ؛ دەرپـەڕیو ‹چاوی زاقە!› ٢. کەوە؛ بـە ڕەنگـی شـینی کـاڵ ‹ڕەنگی زاقە، جوان نییە› ⇐ ١. برآمـدە ٢. بـە رنـگ آبی روشن

- **زاق**[3]: پاشەوشە. دەرپەڕیو ‹چاوزاق› ⇐ برآمده

**زاق**[4]: دەنـگ. ١. دەنگی قەلەڕەشە ٢. قیـژە؛ زیقـە ⇐ ١. صدای زاغ ٢. جیغ

**زاق - زاق** / zaq zaq/: ناو. زەق؛ دۆخی چاو بڕینـە شتێ بۆ ماوەیەک ⇐ زُل

**زاق و زڕووق** / zaq û z(i)rûq/: ☜ **زاق و زووق**

**زاق و زووق** / zaq û zûq/: ناو. زاق و زڕووق؛ زاق و زیق؛ زاک و زووک؛ زاک و زیک؛ چەقە و هەرای منالان ☰ جار و جنجال کودکان

**زاق و زیق** / zaq û zîq/: ☜ **زاق و زووق**

**زاقە** / zaqe/: دەنگەناو. ١. دەنگی تیژی منال ٢. دەنگی گریانی منال ٣. زەقە؛ ڕۆخی باز بوون و گەڕانی چاو. هەروەها: **زاقەی چاو هاتن** ☰ ١. جیغ بچە ٢. صدای گریەی بچە ٣. چشم باز و واگشودە

**زاک**[1] / zak/: ناو. ١. لەتکەی دەنکە قەیسی کە منال کایەی پێ دەکەن ٢. ژەک؛ هەوەڵ دۆشراو لە زاو ☰ ١. نیم هستەی زردآلو کە بازیچەی بچەها است ٢. آغوز

**زاک**[2]: دەنگەناو. قیژەی منال ☰ جیغ بچە

**زاک و زووک** / zak û zûk/: ☜ **زاق و زووق**

**زاک و زیک** / zak û zîk/: ☜ **زاق و زووق**

**زاکوماک** / zak û mak/: ناو. زاوماک؛ بەرخ و مەڕ ☰ برە و میش

**زاکۆن** / zakon/: ☜ **زاکوون**

▣ **بەزاکۆن**: ☜ **بەزاکوون**

**زاکوون** / zakûn/: ناو. زاکۆن؛ ڕێکوپێکی و قانووناری ☰ نظم و قانونمندی

▣ **بەزاکوون**: بەزاکۆن؛ ڕێکوپێک و قانووندار ‹پیاوێکی بەزاکوونە، کەس ناوێرێ لە قسەی لادا› ☰ مُنظم و قانونمند

**زاکە** / zake/: دەنگەناو. جیوەجیوی بەچکەمەل ☰ جیک ـ جیک جوجە

**زاگ**[1] / zag/: ناو. ١. زاو ٢. ژەک؛ فرچک ٣. ☜ **زاخ-٢** ☰ ١. زادە ٢. آغوز ٣. ☜ **زاخ-٢**

• **زاگ**[2]: ☜ **ـ زاو**

**زاگاری** / zagarî/: ناو. ١. زگاری؛ پەشێوی ٢. غەمباری ☰ ١. آشفتگی ٢. غمناکی

**زاگۆر** / zagor/: ناو. پەیاغ؛ توخماخ ☰ چُماق

**زاگە** / zage/: ناو. ١. زاینگە؛ زێد؛ جێگەی لە دایک بوون ٢. منالدان؛ تۆڵدان ٣. گەمەیەکی منالانە ☰ ١. زادگاه ٢. زهدان ٣. از بازی‌ها

**زالمکی** / zalm(i)kî/: ☜ **زوڵم**

**زالمەتی** / zalmetî/: ☜ **زوڵم**

**زالمەی** / zalmey/: ☜ **زاڵم**

**زالمێنی** / zalmênî/: ☜ **زوڵم**

**زالۆ** / zalo/: ☜ **زارو-١**

**زالو** / zalû/: ☜ **زارو-١**

**زالە** / zale/: ☜ **زارو-١**

**زالی** / zalî/: ☜ **زارو-١**

**زاڵ**[1] / zał/: ناو. ژار؛ ژەهر ☰ زهر

**زاڵ**[2]: ئاوەڵناو. ١. سەرکەوتوو؛ چیر؛ چێر ‹هۆنەرێک بووم و لە شێعرا زاڵ بووم/ بە بێ تۆ مات و لە زمانم لاڵ بووم «ئاوات»› ٢. پیر؛ بەساڵاچوو ‹غەم مەخۆ بۆ نان و خوانت، خەڵکی هێشتا نوستووە/ زاڵەکەی دنیا تەنووری مەشریقی داخستووە «حاجی قادر»› ٣. کەژ؛ کەز؛ مووسپی ‹پێم مەڵێ کە ئالی زالی شەو، چاوی بێ‌خەوی چڕە! «سوارە»› ☰ ١. چیرە ٢. پیر ٣. زال

▣ **زاڵ بوون**: ١. سەرکەوتن بە سەر کاری سەختا ‹ئەوەندە هیوابڕاوم کە هاکا بڕوا بە چارەنووس بە سەرما زاڵ بێ «سوارە»› ٢. بەدەسەڵات بوون ‹ژنەکەی بە سەریدا زاڵە› ☰ ١. چیرە شدن ٢. مسلّط بودن

**زاڵ**[3]: پێرۆ. ← **زبڵوزاڵ**

**زاڵم** / załim/: ئاوەڵناو. زالمەی؛ گووجکار؛ ستەمکار؛ ناحەقیکار؛ دەستدرێژکەر بۆ مافی خەڵک ☰ ظالم

**زاڵمایەتی** / załimayetî/: ☜ **زوڵم**

**زاڵمی** / zał(i)mî/: ناو. خوێنخواری ☰ ستمگری

**زاڵنە** / załne/: ناو. پێوەندی لە زنجیر ☰ زنجیر پای‌بند

**زاڵوو / załû/**: ☜ **زاڕوو-١**

**زاڵە / załe/**: ناو. ١. گلە و داد؛ داد و هاوار ٢. ☜ **زراو¹-١** ≊ ١. داد و شکایت ٢. ☜ **زراو¹-١**

⊡ **زاڵە هاتن**‌[مەجاز] داد و هاوار کردن ‹خەڵکی پێ وایە لە خۆشییانە هەرا و گاڵەم دێ/ نا براکەم لە دەسی زاڵەکان زاڵەم دێ «هەژار، بۆ کوردستان»› ≊ داد و بیداد کردن

**زاڵەترەک / załet(i)rek/**: ئاوەڵناو.[کینایی] زارەترەک؛ زارەچوو؛ زەرتەلاق؛ زراوچوو؛ تووشی دڵەڕاوکێ و بیرئاڵۆزی. هەروەها: **زاڵەترەک بوون؛ زاڵەترەک کردن** ≊ زهره‌ترک

**زاڵەتەقێن / załeteqên/**: ئاوەڵناو.[کینایی] پڕمەترسی؛ زۆر بەسام ≊ ترسناک

**زاڵەزاڵ / załezał/**: ناو. گلە و گازندە؛ گلەیی و بناشت ≊ لابه و شکایت

**زاڵەماسە / załemase/**: ناو. پڕخۆری؛ ئاوردمل؛ نەخۆشینی ئاژەڵ کە زاوریان دەماسێ ≊ بیماری کیسه‌ی صفرای حیوانات

**زاڵی / załî/**: ناو. ١. چیری؛ چێری؛ دەس بە سەرداگری ٢. ☜ **زاڕوو-١** ≊ ١. چیرگی ٢. ☜ **زاڕوو-١**

**زام¹ / zam/**: ناو. زیەم؛ برین؛ ڕێش ‹تاقەت بی وە هوون جە سەختی زامان/ تک‌تک چەنی هەرس ڕێزا وە دامان «مەولەوی»› ≊ زخم

**زام²**: ئاوەڵناو. زیەم؛ بریندار ‹دەستی زام› ≊ زخمی

**زاما / zama/**: ☜ **زاوا**

**زامار¹ / zamar/**: ناو. ١. زامدار؛ بریندار ‹زامارەکانیان گەیاندە نەخۆشخانە› ٢. پزدان؛ منداڵدان ≊ ١. زخمی ٢. زهدان

⊡ **زامار کەفتن**: منداڵدان وەرگەڕان ≊ زهدان افتادن

**زامار²**: ئاوەڵناو. زەخمار؛ زامدار؛ بریندار ‹تاو هەناوی نییە وا مات و پەشێو/ لەشی زاماری دەکێشێتە نشێو «سوارە»› ≊ زخمی

**زامایی / zamayî/**: ☜ **زاوایی**

**زامبی / zambî/**: ناو. مردووی جووڵەوەر؛ لاشەی مردوو کە ڕۆحی تێدا نییە، بەڵام دەجووڵێ ≊ زامبی

**زامت / zamit/**: ناو. زامەت؛ کێم؛ هەوا؛ چڵکی برین ≊ ریم؛ چرک زخم

**زامدار / zamdar/**: ☜ **زامار**

**زامروت / zamrut/**: ☜ **زمڕووت**

**زامرووت / zamrût/**: ☜ **زمڕووت**

**زامڕووت / zamřût/**: ☜ **زمڕووت**

**زامڕووتی / zamřûtî/**: ☜ **زمڕووتی**

**زامڕووتین / zamřûtîn/**: ☜ **زمڕووتی**

**زامڕووس / zamřûs/**: ناو. گیایەکی بۆنخۆشە و بۆنی دووکەڵەکەی دەیسووتێنن ≊ گیاه مُر

**زامق / zamiq/**: ناو. زانق؛ زانقی؛ چەسپ؛ کەرستەی ئاوەکی لکاندن ≊ چسب

**زامقکەردە / zamiqkerde/**: ئاوەڵناو. زانق‌کەردش؛ چەسپێنراو؛ لکێندراو ≊ چسبانده شده

**زامقی / zam(i)qî/**: ئاوەڵناو. لک؛ لکۆ؛ لکێن؛ نووسەک؛ پێوەنووسێن ≊ چسبناک

**زامن / zamin/**: ناو. ١. دەستەبەر؛ بەرعۆدە ‹هەر چووینەوە، هەمزە هەڵیپێچام کە ڕاکە و خۆت خەلاس کە! زۆری حەول دا؛ گوتم: چونکە تۆ بوویە زامنم، هەرگیز ڕاناکەم! «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. [کۆن] نیشتمان؛ زێد ‹دەیریی دیدەوان ڕەوێڵەی خوتەن/ بێزار جە زامن دوور کەوتەی وەتەن «بێسارانی»› ٣. [کۆن] نشینگە؛ جێگای مانەوە ‹زامن بەرد وە زێد سایەی درەختان/ تا بە زانوو خاک چوون سیابەختان «مەلا تایر هەورامی»› ≊ ١. ضامن ٢. زادگاه ٣. اقامتگاه

**زامەت¹ / zamet/**: ناو. ١. ☜ **زامت** ٢. زەحمەت؛ ئەرکی گران ٣. دەردی ئەوین ‹زامەت دووریت وە

دڵ کەردەن کار/ سیوا جە مەردەن کەس نەبەردەن چار «بێسارانی»› ☰ ١. ☜ زامەت ٢. زحمت؛ مشقّت ٣. رنج عاشقی

**زامەت**[٢]: ئاوەڵناو. پیچ؛ کەم؛ هندک ☰ اندک

**زامیاد / zamyad/**: ناو. ١. فریشتەی بەرپرسی زەوی لە ئایینی زەردەشتیدا ٢. ناوی ڕۆژی بیست و هەشتمی مانگ لە ساڵی هەتاویدا ☰ ١و٢. زامیاد

**زان**[١] **/ zan/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //زای؛ دەزێی؛ بزێ// ١. زایین؛ منداڵ هێنان؛ بێچوو دیتن؛ زایمان کردن ‹پوورم لفەدوانە زاوە؟› ٢. لە دایک بوون؛ بە دنیا هاتن ‹واقیعەن وایە، وەک بەیانم کرد/ هەرکەسێ زا بە ناعیلاجی مرد «حاجی قادر»› ٣. *[مەجازی، کۆن]* زانەوە؛ هەڵقوڵان؛ هەڵقوڵیان؛ جۆشان؛ دەڵانی ئاو دە کانی و زناودا ☰ ١. زاییدن ٢. زاده شدن ٣. باز جوشیدن (چشمه)

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: زاو/ چاوگی نەرێنی: نەزان

**زان**[٢]: ناو. ١. زەرەر ٢. زوان؛ زمان ☰ ١. زیان ٢. زبان

**▪ زان**[٣]: پاشەوشە. خاوەن زانست ‹فێڵەزان؛ زمانزان› ☰ ـ دان

**زانا / zana/**: ئاوەڵناو. ١. شتزان؛ خاوەن زانست ‹لێرەدا ڕاستەقینەیەک لە بەرچاوی شاعیرە، کە زانا کاری بە سەرییەوە نییە «سوارە»› ٢. ئاگادار؛ خاوەن ئاگایی ‹زانا لە جیهان کەسێکە خەم دانەگرێ/ دڵتەڕ بژی؛ وشکی لە دڵا ڕانەگرێ «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ☰ ١. دانا ٢. آگاه

**زاناڤ / zanav/**: ئاوەڵناو. هەڤرات؛ هاوشێوە؛ لە یەک چوو ‹ئەم جووتە زاناڤی یەکن› ☰ شبیه

**زاناندن / zanandin/**: چاوگ. *[کۆن]* ١. زانین؛ فام کردن ٢. تێگەیاندن؛ فاماندن ☰ ١. دانستن ٢. فهماندن

**زاناهی / zanahî/**: ☜ زانایی

**زانای / zanay/**: چاوگ. زانین ☰ دانستن

**زانایش / zanayş/**: چاوگ. زانین؛ سەردەرچوون ☰ دانستن

**زانایۆخ / zanayox/**: ناو/ ئاوەڵناو. هۆزان؛ فریەزان؛ فرەزان؛ زۆرزان؛ ئەوی زانیاری زۆر و زەبەندی لە هەموو بوارێکدا هەیە ☰ دانشمند؛ علامه

**زانایۆخی / zanayoxî/**: ناو. زانیاری؛ هۆزانی ☰ دانشمندی

**زانایەنە / zanayene/**: ☜ زانایی

**زانایی / zanayî/**: زاناهی؛ زانایەنە؛ زۆرزانی ☰ دانایی

**زانتەی / zantey/**: چاوگ. زانین ☰ دانستن

**زاند / zand/**: ناو. کار و ڕەوتی منداڵ هێنان؛ زایین ☰ زایش

**زاندراو / zand(i)raw/**: ئاوەڵناو. مەعلووم؛ خویا ☰ معلوم؛ مشخص

**زاندۆر / zandor/**: ناو. سەهۆڵخانەی سروشتی لە ئەشکەوت ☰ یخچال طبیعی

**زاندەگونایش / zandegunay(i)ş/**: ئاوەڵناو. تور؛ لاڵەپەتە ☰ الکن

**زانس / zanis/**: ☜ زانست

**زانست / zanist/**: ناو. زانس؛ زاناهی؛ زانیاری؛ تۆرە؛ هین؛ کۆمەڵە زانیاریگەلی ڕێکخراو و تەکووز و شیاو بۆ لێکدانەوە ‹زانستی بژیشکی› ☰ دانش

▣ **زانستی ئەزموونی:** زانستێ کە بابەتەکانی بە پێی ئەزموون و تاقیکردنەوەیە ☰ علوم تجربی

**زانستی بژیشکی/ پزشکی:** زانست، شێواز و بنەماکانی سەر بە ناسین، دەرمان و بەرگری لە نەخۆشی لەشی مرۆ ☰ علوم پزشکی

**زانستی ڕامیاری:** ☜ زانستی سیاسی

**زانستی سیاسی:** زانستی ڕامیاری؛ سەرجەمی بنەما و زانیارییەکانی سەر بە ڕژیمگەلی سیاسی، ماف و پێوەندی نێو گەلان ☰ علوم

سیاسی

**زانستی کۆمەڵایەتی:** زانستێ کە لە سەر بنکە و کردەوەگەلی کۆمەڵگایی مرۆڤ دەکۆڵێتەوە (وەک: زانستی ئابووری و خەلکناسی) ☜ علوم اجتماعی

**زانستی مرۆیی:** ئەو زانستانە کە لە سەر خولقاوەکانی بیر و هێزی مرۆ دەکۆڵنەوە (وەک: فەلسەفە، ئاکار یان زمان) ☜ علوم انسانی

**زانستان** / zanistan/: ناو. فێرگەی باڵا ☜ آموزشگاه عالی

**زانستگا** / zanistga/: ناو. زانستگە؛ دامەزراوەیەکی فێرکاری باڵا بریتی لە چەن زانکۆ بۆ ڕاهێنانی خوێندکار لە بواری جۆراوجۆردا ☜ دانشگاه

**زانستگایی** / zanistgayî/: ئاوەڵناو. ئاکادێمیک؛ پێوەندیدار یان سەر بە زانستگاوە ☜ دانشگاهی

**زانستگە** / zanistge/: ☞ **زانستگا**

**زانستی** / zanistî/: ئاوەڵناو. زانسی؛ پێوەندیدار یان سەر بە زانستەوە ☜ علمی

**زانسی** / zanisî/: ☞ **زانستی**

**زانق** / zaniq/: ☞ **زامق**

**زانقکەردش** / zaniqkerdiş/: ☞ **زامق‌کەردە**

**زانقلە** / zanq(i)le/: ناو. زانقۆلە؛ زەنگەتە؛ تیسک؛ تلیسک؛ پاژێک لە هێشوو ☜ تلسک

**زانقۆلە** / zanqole/: ☞ **زانقلە**

**زانقی** / zan(i)qî/: ☞ **زامق**

**زانک** / zanik/: ناو. ئەلنگە؛ زوانەچکۆلە ☜ زبان کوچک

**زانکۆ** / zanko/: ناو. ١. زانینگە؛ کۆلێج؛ بەشێک لە دامەزراوەیەکی باڵای ڕاهێنان (بەتایبەت زانستگا) کە لقێ لە زانست، هونەر یان زانیاری (یەک یان چەن ڕشتە) تێدا دەخوێندرێ ٢. جێ کۆ بوونەوەی زانایان ☜ ١. دانشکده ٢. مجمع علمی

**زانگۆن** / zangon/: ناو. ١. قانوون؛ یاسا ٢. بڕیار؛ فەرمانی گشتی دەوڵەتی ☜ ١. قانون ٢. مُقررات

**زانگۆنی** / zangonî/: ئاوەڵناو. قانوونی؛ یاسایی ☜ قانونی

**زانگە** / zange/: ☞ **زایینگە**

**زانن** / zanin/: چاوگ. زانین ☜ دانستن

**زانۆ** / zano/: ☞ **زرانی**

**زانوو** / zanû/: ناو. ١. ☞ **زرانی** ٢. بۆری چەماوە؛ لوولەیەکی بچووکی داشکاو بە سێلەی جۆراوجۆرەوە بۆ گۆڕانی باری لوولە یان لێوە بوونی لوولەیەکی‌تر و... ☜ ١. ☞ **زرانی** ٢. لولەی زانویی

**زانەخرۆ** / zanex(i)ro/: ☞ **زیانەخورۆ**

**زانەڤان** / zanevan/: ئاوەڵناو. زانیار؛ خاوەن زانست ☜ دانشور

**زانەوە** / zanewe/: چاوگ. تێنەپەڕ. //زایەوە؛ دەزێیەوە؛ بزێوە// ١. ئاو دەرچوون لە وشکانی ٢. ئاو لە کوێرە کانی هەڵقوڵینەوە ٣. دیسانەوە زان ☜ ١. تراویدن؛ سر زدن آب از خشکی ٢. زهیدن؛ جوشیدن آب از چشمەی خشک ٣. باز زاییدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: زاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەزانەوە

**زانەوێر** / zanewêr/: ناو. ئاڵوگۆڕ ☜ تعویض

**زانەیش** / zaney(i)ş/: چاوگ. زانیایش؛ پێزانین؛ ئاگەدار بوون ☜ آگاهی یافتن

**زانی**[1] / zanî/: ☞ **زرانی**

**زانی**[2]: ئاوەڵناو. ئارام؛ هێمن ☜ آرام

**زانیار**[1] / zan(i)yar/: ناو. هۆزان؛ کەسێ کە لە بوارێکی زانستیدا بیر و ڕا و زانیاری بنەڕەتی هەبێ ‹گەر خۆت بکەیە بژیشک و زانیار/ چاوت دەکەوێ بە هەردوو دلدار «هەژار، *مەم‌وزین*»› ☜ دانشمند

**زانیار**[2]: ئاوەڵناو. دانا؛ زانا ☜ دانا

**زانیاری** / zan(i)yarî/: ناو. ١. ئاگایی ‹گەردوون

وەکوو دێو بەراوەژووون ئاکاری/ هاواڵی نەزانانـە، دژی زانیاری «هـەژار، مـەموزیـن»› ٢. ☜ زانست ٣. ئەوەی زانراوە و دەرکەوتووە ⚟ ١. دانایی ٢. ☜ زانست ٣. معلومات

**زانیایش** / zan(i)yayiş/: ☜ زانەیش

**زانین** / zanîn/: چـاوگ. تێـەر. //زانیـت؛ دەزانی؛ بزانە// پەی بردن؛ بلیان؛ زۆنـای؛ زانـای؛ زانـایش؛ زانن؛ سەر بوونەوە؛ سەر دەرچوون؛ فەرکانـدن ⚟ فهمیدن؛ دانستن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەزانین

**زانینگە** / zanînge/: ☜ زانکۆ ـ١

**ـ زاو** / zaw-/: پاشەوشە. ـ زاگ؛ ـ زاییگ؛ لە دایـک بوو ‹تازەزاو› ⚟ ـ زاده

**زاوا** / zawa/: نـاو. زاڤا؛ زاما؛ زومـا؛ زەمـا؛ زەوا: ١. یەزەن؛ مێردی کچ یان خوشک ٢. چراخ؛ چـراغ؛ تازەمێرد ⚟ ١و٢. داماد

**زاوابەند** / zawabend/: ☜ زاوابەندی

**زاوابەندی** / zawabendî/: نـاو. زاڤابەندی؛ زاوابەند؛ زاوارە؛ زاوارێوی؛ ئەو پیاوە لە ماڵی باوکی ژنەکەی دەژی ⚟ داماد سرخانه

**زاوارە** / zawaře/: ☜ زاوابەندی

**زاوارێوی** / zawařêwî/: ☜ زاوابەندی

**زاوازێرینە** / zawazêřîne/: ناو. تازەزاوا ⚟ تازەداماد

**زاوایەتی** / zawayetî/: ☜ زاوایی

**زاوایی** / zawayî/: ناو. زامایی؛ زاوایەتی؛ دۆخ یـان چۆنیەتی زاوا بوون ⚟ دامادی

**زاوت** / zawit/: نـاو. سـورباش؛ کارگێـڕی ئاغـا ⚟ مُباشر

**زاور** / zawir/: ناو. ١. ☜ زراو ٢. منال؛ بێچوو ⚟ ١. ☜ زراو ٢. بچه

⊡ **زاور چوون**: ١. زارە چوون ٢. بێچوو مردن ⚟ ١. زهرەترک شدن ٢. بچه مردن

**زاوران** / zaw(i)ran/: ☜ زەیسان

**زاورۆ** / zawro/: ☜ زارۆ

**زاوزاتوول** / zawzatûl/: نـاو. بەچکـە و مەچکـە؛ منداڵی ورد و زۆر ⚟ بچەهای قد و نیم‌قد

**زاوزۆ** / zawzo/: ☜ زاوزوو

**زاوزوو** / zawzû/: نـاو. زاوزۆ؛ زاوزێ؛ زەو؛ زکـوزا؛ زگـوزا؛ زەوزوو؛ زەوەززە؛ زێوزا؛ زێوزوو؛ زەوەزە؛ زەو و زوو؛ سـکـوزان؛ زادو وەڵـەد؛ زاوەڵزای؛ زایەنە (بۆ ئاژەڵ)؛ ڕەوتی بێچوو هێنـان و تۆرەمـە خستنەوە ⚟ زادوولد

**زاوزیچ** / za w zîç/: ☜ زاروزیچ

**زاوزێ** / zawzê/: ☜ زاوزوو

**زاوزێکەر** / zawzêker/: ئاوەڵناو. خاوەن توانـایی و لێهاتوویی زایین ⚟ زاینده

**زاوق** / zawiq/: ناو. جیوە ⚟ جیوه

**زاول** / zawil/: ناو. ملۆزم؛ مێمل ⚟ مُزاحم

**زاولانە** / zawlane/: ☜ زەولان ـ٢

**زاوڵ** / zawił/: ناو. ملۆزم؛ مێمل ⚟ آفت؛ مزاحم

**زاوڵە** / zawłe/: ☜ زارۆ

**زاوڵـەدار** / zaw(i)łedar/: ئاوەڵـناو. منداڵـدار؛ مناڵدار ⚟ بچه‌دار

**زاوڵەیی** / zawłeyî/: ☜ زارۆڵەیی

**زاوما** / zawma/: ناو. زاومـاک؛ زاوەمـاک؛ سـاواما؛ مەڕ و بەرخ و بزن و کاریلـەی تێکـەڵاو ⚟ بـرّه و بُزغاله و مادرانشان

**زاوماک** / zawmak/: ☜ زاوما

**زاوە** / zawe/: ☜ زاڤ[1] ـ١

**زاوەران** / zaweran/: ☜ زەیسان

**زاوەرە** / zawere/: ناو. ١. ☜ زارۆ ٢. ☜ زراو[1] ـ١

**زاوەڵزای** / zawełzay/: ☜ زاوزوو

**زاوەماک** / zawemak/: نـاو. زاومـاک؛ زاومـا ‹لـە لایەک زاوەماک دەڕوا، لە لایەکی دەکەن هـاوێر/ لـە لایـەک باسـکی هەڵماڵـیوە بێـری، مـەڕ دراوە بێـر «هێمن»› ⚟ برّه و بُزغاله و مادرانشان

**زاویته** / zawîte/: ناو. بای ساردی ڕۆژهەلات ☰ باد سرد شرقی

**زاوێر** / zawêr/: ئاوەڵناو. زاڤـێر؛ ڕاحەت بـوو؛ لـه جووت بوون حەساوه (بۆ ژن) ☰ ارضا شده (زن)

**زای**[1] / zay/: چاوگ. زان: ١. زایین؛ بێچوو هێنـان ٢. زۆر کردن؛ زیاد بوون ☰ ١. زاییدن ٢. افـزایش یافتن

**زای**[2]: نـاو. ١. ☜ **زاخ ـ٢** ٢. مشـت و مـاڵ ☰ ١. ☜ **زاخ ـ٢** ٢. صیقل

**زایا**[1] / zaya/: ☜ **زاروزێچ**

**زایا**[2]: ئاوەڵناو. زایـێ؛ بـزۆک؛ زەڤـۆک؛ بـه زکـوزا؛ لێهاتوو له زاوزێدا ☰ زایا

**زایاندن** / zayandin/: چـاوگ. تێـەپ. //زایانـدت؛ دەزایێنی؛ بزایێنه// یاری کردنی دایک له زانـدا ☰ زایاندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەزایاندن

**زایش** / zayiş/: چـاوگ. زان؛ بێچـوو هێنـان ☰ زاییدن

**زایف** / zayif/: ئاوەڵناو. لاواز؛ کەنەفت؛ کز؛ لـەڕ ☰ ضعیف

**زایفه** / zayfe/: ناو. *[کینایه]* ئافرەت؛ ژن ☰ زن

**زایڵه** / zayłe/: ☜ **زایەڵە ـ٢**

**زاین** / zay(i)n/: ☜ **زایین**

**زاینده** / zayinde/: ئاوەڵناو. بەدیهاتوو؛ له دایک بوو ‹زایندەی هەورامانه› ☰ زاده؛ متولد

**زاینگه** / zayinge/: نـاو. ١. ☜ **زاگه ـ١** ٢. ☜ **زایینگه**

**زایه**[1] / zaye/: ناو. ١. پیزه؛ تـۆل ٢. تۆرەمـه ☰ ١. جنین ٢. نسل

**زایه**[2]: ئاوەڵناو. ١. لەکارکەوتوو ٢. خەسـار؛ فـەوتاو ٣. گـوم؛ ون؛ ونـدا* هـەروەها: **زایـه بـوون؛ زایـه کردن** ٤. *[مەجاز]* مردوو ☰ ١. ضایع ٢. هدررفتـه ٣. گُم؛ ناپیدا ۴. مُرده

**ـ زایه**[3]: پاشەوشه. ـ زاده؛ منداڵ ‹شازایه› ☰ ـ زاده

**زایەڵە** / zayełe/: نـاو. ١. پێـژن؛ گـومنی؛ ڕەوتی دەنگ دانەوه ٢. زایڵه؛ دەنگی شـیوەن و گریـان ‹یاونا وه کاو هەردەی کۆسـاری/ لـوا چـەنی دمنـگ زایەڵەی زاری «خانای قوبادی»› ☰ ١. انعکاس صـدا ٢. صدای گریه و شیون

**زایەنـد** / zayend/: نـاو. سـێکس؛ کـار و بـاری جینسی ☰ سکس

**زایەندی** / zayendî/: ئاوەڵناو. سێکسی؛ پێوەندیدار به کار و باری جینسییەوه ☰ سکسی

**زایەنه** / zayene/: چـاوگ. زایـن؛ زان (ئـاژەڵ) ☰ زاییدن (حیوان)

**زایـەنـەر** / zayener/: نـاو. ژێنراتـۆر؛ موەلیـد؛ مەکینەی بەرهەمهێنی وزەی کارەبا ☰ ژنراتور

**ـ زایی** / zayî-/: پاشەوشـه. ـــ زێیـی؛ ـ هـێنی ‹گەرمازایی› ☰ ـ زایی

**ـ زاییگ** / zayîg/: ☜ **ـ زاو**

**زایین** / zayîn/: چـاوگ. تێنەپـەڕ. //زاییـت؛ دەزێـی؛ بزێ// زان؛ زاین: ١. بێچوو هێنـان ٢. *[کینایه]* زۆر بوون ‹تەواو بوونی نییه، هەر له بەرێکەوه دەزێ› ☰ ١. بچه آوردن ٢. فراوان شدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: زاییـو/ چـاوگی نـەرێنی: نەزایین

**زایینگه** / zayînge/: ناو. زانگه؛ زاینگه؛ نەخۆشخانه یـان دەرمانگـەی تایبـەت بـه زایـینی ژنـان ☰ زایشگاه

**زایینی**[1] / zayînî/: نـاو. ساڵـپێوی مەسـیحی کـه سەرەتاکەی لـه دایـک بـوونی حـەزرەتی عیسـا مەسیحه ☰ میلادی

**زایینی**[2]: ئاوەڵـناو. بەپێی ساڵپێوی مەسیحی ‹ساڵی زایینی› ☰ میلادی

**زایێ** / zayê/: ☜ **زایا**[2]

**زباره** / z(i)bare/: نـاو. زەباره؛ هەرەوەز؛ ئاریکـاری

کۆمەڵ لە کاردا ⇐ کار تعاونی

**زبان** / z(i)ban/: ☜ **زمان**

**زبانناس** / z(i)bannas/: ☜ **زمانەوان**

**زبانناسی** / z(i)bannasî/: ☜ **زمانەوانی**

**زبت** / zibt/: ناوەڵناو. زرینگ؛ زرنگ؛ زیتەڵ ⇐ زرنگ

**زبر** / zib(i)r/: ناوەڵناو. زرب؛ زرپ؛ زوور؛ زرو؛ زرۆ؛ زوفت؛ زوڤر؛ زێر؛ سبر؛ گڕ؛ گڕناڵ؛ گەرووز؛ گرس؛ گرژ؛ گزم؛ دشت؛ ڕووش؛ ڕووشە؛ قەرت؛ خـێخ؛ گوژم؛ بە ڕووکارێکی ناساف و چاڵ و بەرزی ورد و ڕەقەوە ⇐ خَشن؛ زِبر

**زبران** / zibran/: ناو. زڕبان؛ زروان؛ کێڵگەی بە کلۆ و بەردەڵان ⇐ زمین زبر و سنگلاخی

**زبرە** / zibre/: ناو. زروە؛ زوورە: ١. قرتیل؛ درشتەی ساوار و گەنمەکوتاو ٢. کەپەک؛ درشتەی لە هێلەگ‌دراو ⇐ ١. دانەهای درشت بلغور و گندم کوبیده ٢. نُخالەی غله

**زبری** / zibrî/: ناو. زووری؛ زروی ⇐ زبری

**زبلدان** / z(i)bildan/: ☜ **زبڵدان**

**زبلگە** / z(i)bilge/: ☜ **زبڵدان**

**زبلەک** / ziblek/: ڕیخۆڵەی گەورە؛ ڕیخۆڵەی ئەستوور ⇐ رودەی بزرگ

**زبڵ** / z(i)bił/: ناو. ١. زبیل؛ زبێڵ؛ زوێل؛ زبل و زاڵ؛ زلگە؛ ڕماڵ؛ گلێش؛ شەخەڵ؛ گناڵ؛ گەناڵ؛ گەناڵخە؛ گناڵخە؛ گەنەڵخە؛ گوهوور؛ شتانی بێبایەخ بۆ فڕەدان (وەک: پاشماوەی پێخۆر، توێکڵی میوە، شرەکاغەز و ئەوەی لە گەسک داندا کۆ دەبێتەوە) ٢. پەین و پاڵ ⇐ ١. آشغال ٢. فضولات دامی

**زبڵاخە** / zibłaxe/: ☜ **زبڵدان**

**زبڵچی** / z(i)bilçî/: ☜ **زبڵڕێژ**

**زبڵدان** / z(i)biłdan/: ناو. زبلگە؛ زبلاخە؛ زبلکوان؛ زبلدان؛ جێگەی لێڕشتن یان تێڕشتنی زبل ⇐ آشغالدانی

**زبڵڕێژ** / z(i)biłřêj/: ناو. زبلچی؛ کەسێ کە زبڵوزاڵی شوێنی ڕادەماڵێ و فڕێی دەدا ⇐ رُفتگر

**زبڵکوان** / z(i)biłk(i)wan/: ☜ **زبڵدان**

**زبڵکێش** / z(i)biłkêş/: ناو. کەرەسە یان ماشینی زبڵ گواستنەوە ⇐ زُبالەکش

**زبڵماڵ** / zibiłmał/: ناو. سەبرگەچی؛ سپوور ⇐ رُفتگر

**زبڵوزاڵ** / z(i)bił û zał/: ناو. خـڕوخاش؛ گەندوگەبار؛ شتی کۆکراوە بۆ فڕێدان ⇐ آت‌وآشغال

**زبیل** / z(i)bîl/: ☜ **زبڵ-١**

**زبیلڕێژ** / z(i)bîlřêj/: ناو. سپوور؛ کۆلانماڵ ⇐ رُفتگر

**زبێڵ** / z(i)bêł/: ☜ **زبڵ-١**

**زپ** / zip/: ناوەڵناو. تژە؛ پڕ؛ پڕاوپڕ ⇐ مالامال

**زپرک** / ziprik/: ☜ **زیپکە-١**

**زپرکە** / zipirke/: ☜ **زیپکە-١**

**زپک** / z(i)pik/: ☜ **زیپکە-١**

**زپەڕ** / z(i)peř/: ناو. لە سەر پەڕ؛ لای پێش یان دوایی ڕیز ⇐ اول یا آخر صف

**زت**[1] / zit/: ناو. زوچ؛ گەمەیەکە بە وردەبەرد ئەکرێ ⇐ نوعی بازی با شن

**زت**[2]: ناوەڵناو. ١. ڕاست؛ ڕەپ؛ بێ لاری و خواری ٢. باوخۆش؛ بالادەست؛ لە پێش لە کار و کایەدا ٣. زج؛ دژ ٤. پەتی؛ ڕووت و قووت ⇐ ١. قُد ٢. بالادست ٣. ضد ۴. لُخت؛ عُریان

**زتم** / zitm/: ناو. کاری بەستنی دەرگا و پەنجەرە و... ⇐ عمل بستن در و پنجره و ...

**زتمی** / zitmî/: ناوەڵناو. داخراو؛ بەستراو ⇐ بسته

**زج** / zic/: ☜ **زت**[2]**-٣**

**زجاو** / z(i)caw/: ناو. زەنج؛ زۆنگ؛ زەلکاو ⇐ باتلاق

**زچ** / ziç/: ناو. ١. سچ؛ سچ؛ سژ؛ قورنوو؛ مێرووویەکی سوورە بە ئاژەڵەوە دەنووسێ ٢. ☜ **زەچ**[1] ≡ ١. حشره‌ای که به دام می‌چسبد ٢. ☜ **زەچ**[1]

**زچە** / z(i)çe/: دەنگەناو. زچەزچ؛ دەنگی نم دانی ئاو ≡ صدای نَشت آب

⊡ **زچە هاتن**: نم دان؛ ئاو لێوە دەڵان ≡ نشت کردن

**زچەزچ** / z(i)çeziç/: ☜ **زچە**

**زچین** / z(i)çîn/: چاوگ. چاو ئێشان ≡ آزار داشتن چشم

**زچێن** / z(i)çên/: ناو. نۆڕیزکێن؛ نەهلک؛ گەمەیەکە بە چەو ئەکرێ ≡ نوعی بازی با شن

**زخ**[1] / zix/: ☜ **زیخ**[1]**-١**

**زخ**[2]: ئاوەڵناو. سەخت ≡ سخت

**زخت** / zixt/: ناو. نەقیزە ≡ سیخونک

**زخدان** / zixdan/: ناو. جێگەی قوومی فرە ≡ شنزار

**زخرە** / zixre/: ناو. تفاق؛ ئازووقەی ساڵ ≡ آذوقه

**زخور** / z(i)xur/: ناو. زغرک؛ چەو؛ وردەبەرد ≡ سنگریزه

**زدک** / z(i)dik/: ناو. زیپکە؛ جۆش ≡ جوش

**زدێ** / z(i)dê/: ناو. هێز؛ توانا؛ تاقەت ≡ نا؛ توان

**زر** / zir/: ئاوەڵناو. وشک ≡ خُشک

**زرا** / z(i)ra/: ئاوەڵناو. زر؛ وشک؛ ویشک ≡ خُشک

**زرار** / z(i)rar/: ☜ **زیان**

**زراری** / z(i)rarî/: ناو. قوپچە؛ قوببە؛ دوگمە ≡ دگمه

**زراسک** / z(i)rask/: ناو. کۆرپە؛ منالی ساوا ≡ نوزاد

**زراڤ** / z(i)rav/: ئاوەڵناو. زراو: ١. باریک؛ تەنک؛ بە پانایی کەمەوە ٢. قەدباریک؛ بالابەرزی ناوقەدباریک ≡ ١. باریک ٢. باریک اندام

**زراڤک** / z(i)ravik/: ☜ **زراو**[1]**-١**

**زراڤی** / z(i)ravî/: ناو. باریکی؛ ناسکی ≡ باریکی

**زراڤیک** / z(i)ravîk/: ئاوەڵناو. زۆر ناسک ≡ بسیار نازک

**زراق** / z(i)raq/: ناو. گزینگی هەتاو؛ هەوەڵ تیشکی خۆر کاتی بەیانی ≡ اوّلین تابش آفتاب صُبحگاه

**زرانۆ** / z(i)rano/: ☜ **زرانی**

**زرانوو** / z(i)ranû/: ☜ **زرانی**

**زرانی** / z(i)raî/: ناو. زانۆ؛ زانوو؛ زانی؛ زرانوو؛ زرانۆ؛ ئەژنۆ؛ وژنگ؛ ژوونی؛ چۆک؛ جمگەیێ لە پای مرۆڤ و چوارپێیاندا، لە نێوان ئێسکی ڕان، کەشکەوژنگ (کلاوەژنۆ) و بەلەکدا، هەروەها ئەو بەشە لە پێ کە ئەژنۆش دەگرێتەوە ≡ زانو

**زراو**[1] / z(i)raw/: ناو. زارە؛ زاور؛ زاڤر: ١. زاراو؛ زاڵە؛ زراڤک؛ زەراڤ؛ زەلە؛ زەلک؛ زەهلک؛ زەهلە؛ زەلگ؛ کیسەی زەرداو ٢. ورە؛ زار؛ زەلە؛ زات؛ بوێری ≡ ١. زَهره ٢. جُرأت

⊡ **زراو بردن**: *[مەجاز]* ترساندن ≡ زهره‌ترک کردن

**زراو تۆقین**: *[کینایی]* زراو چوون؛ زراو نەمان؛ زۆر ترسان ≡ زهره‌ترک شدن

**زراو چوون**: ☜ **زراو تۆقین**

**زراو ڕژان**: *[کینایی]* تۆقین؛ زیق کردن «منیش زراوم ڕژاوە/ دەترسم لە سەرەمەرگا/ سیبەکانم بزریکێنن بۆ تۆسقالێ هەوای ولات! «پەشێو»» ≡ زهره‌ترک شدن

**زراو نەمان**: ☜ **زراو تۆقین**

**زراو**[2]: ☜ **زراڤ**

**زراوبردوو** / z(i)rawbirdû/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* تەواو تۆقاو؛ زۆر ترساو ≡ زهره‌ترک شده

**زراوچوو** / z(i)rawçû/: ☜ **زاڵەترەك**

**زرایەنە** / z(i)rayene/: ☜ **زرایش**

**زرب** / zirb/: ☜ **زبر**

**زرپ** / zirp/: ئاوەڵناو. ١. *[پڵار]* قەبە؛ زەلام ٢. ☜ **زبر** ≡ ١. گُنده ٢. ☜ **زبر**

**زرپان** / zirpan/: چاوگ. زرەپیای؛ زەرپە خواردن ☰ ضربه خوردن

**زرپوزیندو** / zirp û zîndû/: ئاوەڵناو. زرپوزیـنی؛ ساغ و وریا ☰ سالم و سرحال

**زرپوزینی** / zirp û zînî/: ☜ **زرپوزیندو**

**زرت**[1] / zirt/: ناو. زرتە؛ تماشای بێ چاولێکـدان ☰ نگاه خیره

**زرت**[2]: ئاوەڵـناو. *[پلار]* زرتـە؛ زرتـەبۆز؛ زرتـەزەلام؛ زرتەسوور؛ زڕەمێر؛ تەژەی گۆشتن ☰ لندهور

**زرتخانە** / zirtxane/: نـاو. جێگـەی کێبـەرکێ و گاڵتە و قەشمەری ☰ جای مسابقه و سرگرمی

**زرتە** / zirte/: ☜ **زرت**

**زرتـەبۆز** / zirteboz/: ئاوەڵـناو. ١. *[پـلار]* پـیری تەژەی خوێنتاڵ ٢. ☜ **زرت**[2] ☰ ١. پیـر گنـدەی بدقواره ٢. ☜ **زرت**[2]

**زرتەزرت** / zirtezirt/: ناو. *[پلار]* تماشـای خێـرا ـ خێرا و بێ چاو ترووکاندن ☰ نگاه خیره

**زرتەزەلام** / zirtezelam/: ☜ **زرت**[2]

**زرتەسوور** / zirtesûr/: ☜ **زرت**[2]

**زرجک** / zircik/: ناو. گیایەکە ☰ گیاهی است

**زرچ** / zirç/: نـاو. ١. ڕیقنە؛ جیقنەی مەل ٢. چرۆ؛ چەکەرەی تازە دەرهاتوو ☰ ١. چلغـوز ٢. جوانـەی تازه

**زرچک** / zirçik/: ناو. جووتە؛ لووشکە؛ لەقەی کـەر و هێستر ☰ جُفتک

**زرخ** / zirx/: ☜ **زرێ ـ١و٢**

**زرز** / zirz/: ئاوەڵـناو. ١. زیــز؛ زوویــر؛ تــووڕە ٢. شەمبووز؛ نائارام ☰ ١. عصبانی ٢. چموش

**زرزی** / zirzî/: ناو. تووڕەیی؛ زوویری ☰ عصبانیت

**زرعات** / zir'at/: نـاو. زەراعـەت؛ کشـتوکـاڵ ☰ کشت

**زرفستەق** / zirfisteq/: ناو. بادامزەوینی ☰ بادامزمینی

**زرک**[1] / zirk/: ناو. ١. زەرک؛ تاسۆکە ٢. حـەنجۆر؛ گندۆرەی کاڵ؛ قەرەخرچە؛ گیایـەکی بێسـتانییە بەری وەک گڕکە دەگرێ ٣. بەری ئـەو گیـا بـە ڕەنگی شەمامە بەڵام گەورەتر ☰ ١. طاس مسـین ٢. گیاهی است ٣. محصولِ شبیه دستنبو آن گیاه

**زرک**[2]: ئاوەڵناو. چوست؛ چالاک ☰ چالاک

**زرکتک** / zirk(i)tik/: ☜ **زەرگەتە**

**زرکوزینگ** / zirk û zînig/: ئاوەڵـناو. زرپوزیـنی؛ وریا و چـالاک؛ چوسـت و مـەزبووت ☰ چسـت و چالاک

**زرکەتاڵە** / zirketałe/: ☜ **زەرەند**

**زرکەتی** / zirketî/: دەنگەناو. دەنگی کەوتنی کـانزا ☰ صدای افتادن فلز

**زرگـەزۆک** / zirgezok/: نـاو. دەسـخۆرێ؛ گەزگەزک؛ گیایەکی ئالیکی بـە گـەڵا و لاسـکی کورکنەوە، لە پێست کەوێ، دەیچووزێنێتـەوە ☰ گزنه

**زرم** / zir(i)m/: ☜ **زرمە**

**زرمتانە** / zirm(i)tane/: ناو. تۆڵە ☰ انتقام

**زرموکوت** / zirm û kut/: دەنگەناو. زرمـەی زۆر ☰ تلاپ و تلوپ

**زرمـە** / zirme/: دەنگـەناو. زرم؛ دەنگــی کــەوتنی شتی نەرم و گران ☰ تلاپ

▣ **زرمە لێ هەستان**: دەنگی زرمەزرم لە شـتێکەوە هاتن ☰ صدای تلاپ تلوپ آمدن

**زرمە هـاتن**: دەنگی ڕمان و کەوتنی شتێ هـاتن ☰ صدای تالاپ تلوپ برخاستن

**زرمەزرم** / zirmezirm/: دەنگەناو. زرمەی لە پەسـتا ☰ صدای تالاپ تلوپ پیاپی

**زرمەزلیتانێ** / zirmez(i)lîtanê/: ☜ **زرمەزلێ**

**زرمەزلیتە** / zirmez(i)lîte/: ☜ **زرمەزلێ**

**زرمــەزلێ** / zirmez(i)lê/: نــاو. زرمـــەزلیتانێ؛ زرمەزلیتە؛ ڕمبازی؛ کاری هەڵبەزین و ملە دە بەر یەک نان بۆ گاڵتە ☰ کار گلاویز شدنِ دوستانه

**زرنگ** / z(i)ring/: ☜ **زرینگ**

**زرنگان** / z(i)ringan/: ☜ **زرینگان**

**زرنگاندنەوە** / z(i)ringand(i)newe/: چاوگ. تێپەر. //زرنگاندتەوە؛ دەزرنگێنیەوە؛ بزرنگێنوە// زرینگە لێ هەڵساندن؛ دەنگ دەرهێنان لە کانزا بەتایبەت زێڕ و زیو و مس ☗ به صدا درآوردن فلزات

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: —/ چاوگی نەرێنی: نەزرنگاندنەوە

**زرنگانەوە** / z(i)ringanewe/: ☜ **زرینگانەوە**

**زرنگوزیت** / z(i)ring û zît/: ئاوەڵناو. مەزبووت و وریا؛ زرنگ و وشیار ☗ زِبر و زرنگ

**زرنگوهۆڕ** / z(i)ring û hoř/: دەنگەناو. زرنگەزرنگ؛ زرنگەی زۆر ☗ جرینگ ـ جرینگ

**زرنگە** / z(i)ringe/: ☜ **زرینگە**

**زرنگەزرنگ** / z(i)ringez(i)ring/: ☜ **زرنگوهۆڕ**

**زرنگی** / z(i)ringî/: ☜ **زرینگی**

**زرنگیایەوە** / z(i)ring(i)yayewe/: ☜ **زرینگانەوە**

**زرنگین** / z(i)ringîn/: ☜ **زرینگین**

**زرو** / zirw/: ☜ **زبر**

**زروان** / zirwan/: ناو. زروانی؛ شوێنی زبر و پڕ لە کەندوکلۆ ☗ زمین ناهموار سنگلاخ

**زروانی** / zirwanî/: ☜ **زروان**

**زروە** / zirwe/: ناو. ١. گوڵەهەنگوین؛ زەروە زەرد؛ گیایەکی چەن ساڵانەیە، لاسکەکەی ڕاست هەڵدەچێ و باڵای تا میترێک بەرز دەبێ، گەڵاکانی بێ قنچک لە لاسکەوە جیا دەبنەوە و گوڵی زەرد دەکا و وەک دەرمانی خۆماڵی برینپێچی و سارێژ کردن کەڵکی لێ وەردەگرن ٢. سیمی دەفر شتن ٣. پارەی گرانبایی؛ ئەسکەناسی درشت ٤. ☜ **زبرە** ☗ ١. شاهاسپرم ٢. سیم ظرفشویی ٣. اسکناس درشت ۴. ☜ **زبرە**

**زروی** / zirwî/: ☜ **زروێ**

**زرویای** / zirw(i)yay/: چاوگ. هەڵزڵەپان ☗ جوش زدن

**زروێ** / zirwê/: ناو. زروی؛ زرۆیی؛ شۆرەک ☗ اُشنان

**زرۆ** / z(i)ro/: ئاوەڵناو. زرب؛ زوور؛ بە ڕووکارێکی ناسافەوە ☗ زِبر

**زرۆپ** / z(i)rop/: ئاوەڵناو. نوقستان؛ کۆڵەندام؛ ڕینجۆ ☗ فلج

**زرۆیی** / z(i)royî/: ☜ **زروێ**

**زروو** / z(i)rû/: ناو. گیایەکی گەڵاباریکە ☗ گیاهی است

**زرووبی** / z(i)rûbî/: ناو. زلووبی؛ ناوساجی؛ نانساجی؛ کولێرەی تەنکی لە ڕۆندا هەڵقرچاو ☗ نوعی نان روغنی

**زرووق**[١] / z(i)rûq/: ناو. ترس و لە لانە دەرپەڕینی نێچیر ☗ ترس و رمیدن شکار

**زرووق**[٢]: دەنگەناو. زرەق؛ تریقەی پێکەنینی ساوا ☗ صدای خندەی بچە

**زرووقان** / z(i)rûqan/: چاوگ. ١. بازرە بوون ٢. ☜ **زرووقانەوە** ☗ ١. رمیدن شکار ٢. ☜ **زرووقانەوە**

**زرووقاندن** / z(i)rûqandin/: ☜ **زرووقانەوە**

**زرووقانەوە** / z(i)rûqanewe/: چاوگ. تێپەڕ. //زرووقایەوە؛ دەزرووقێیەوە؛ بزرووقێوە// زرووقان؛ زرووقاندن؛ زرێقنای؛ زرێقیای؛ تریقانەوەی منداڵی ساوا ☗ قهقه زدن نوزاد

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: زرووقاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەزرووقانەوە

**زرووقاو** / z(i)rûqaw/: ئاوەڵناو. زرپاگ؛ بازرە؛ بازرەبوو ☗ متواری از ترس (شکار)

**زرووقە** / z(i)rûqe/: ناو. بریقە؛ شۆق ☗ درخشش

**زرووکە** / z(i)rûke/: دەنگەناو. ١. ☜ **زرووکەزرووک** ٢. جیکی مشک ☗ ١. ☜ **زرووکەزرووک** ٢. صدای موش

**زرووكەزرووك** / z(i)rûkez(i)rûk/: دەنگەناو. زرووكە؛ جرووكە؛ دەنگی مەلی پچووك ﷼ جیک ـ جیک گنجشكان

**زرە** / z(i)re/: ☜ **زرێ ـ١و٢**

**زرەپنای** / z(i)repnay/: ☜ **زەرپانن**

**زرەپەتنای** / z(i)repetnay/: چاوگ. زرمــە لــێ هەڵساندن؛ بە زەرپ كوتانـدن ﷼ كـوفتن؛ ضـربە زدن

**زرەپەتیای** / z(i)repetyay/: چاوگ. زرمــە لــێ هەڵسان؛ بە زەرپ كوتران ﷼ كوبیدە شدن

**زرەپیای** / z(i)repyay/: ☜ **زرپان**

**زرەك** / z(i)rek/: ناو. تانەی سەر چاوی یەكسـم و ماڵات كە لە برووسكەوە تووشیان دێت ﷼ لكـەی چشم حیوانات بر اثر آذرخش

**زرەگەنە** / z(i)regene/: ناو. گیایەكی بۆنناخۆشـە بە بەری خڕ و دڕكاوییەوە ﷼ گیاهی بدبو

**زرەنگ** / z(i)reng/: ئاوەڵناو. پیتـۆڵ؛ لێهـاتوو ﷼ زرنگ

**زرەنگی** / z(i)rengî/: نـاو. دەمودوو؛ دەمودوود ﷼ زرنگی

**زرهۆك** / zirhok/: نـاو. گوڵابــاتوون؛ شــریتەی ڕەنگینی ملی عابا ﷼ گلابتون

**زریا** / zirya/: ☜ **زەریا**

**زریان** / ziryan/: نـاو. زلان؛ زەلان؛ زەران؛ بــای ساردی پاییزان ‹جـەرگمان بـریان، دیـدە بریانـەن/ هەناسەمان سارد وێنەی زریانەن «خانـای قوبـادی»› ﷼ باد سرد پاییزی

**زریای** / ziryay/: چـاوگ. ١. جـۆش هەڵـدان ٢. ژاكان ﷼ ١. جوش درآوردن ٢. پژمُردن

**زریچ** / z(i)rîç/: نـاو. ژریژ؛ ژریژ؛ ژێریژ؛ مز؛ قەلایی؛ قالایی؛ قەلای؛ قەلا؛ كەلناس؛ توخمی كیمیـاوی كانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ٥٠ و كێشی ئـەتومی ١١٨،٦٩، سپی مەیلەو شـین، بریقـەدار، نـەرم و چەكوشخۆر، كە بۆ چێكرنی تەنەكە و ئالیاژیتـر بە كار دێ ﷼ قلع

**زریچە** / z(i)rîçe/: ناو. دەریاچە؛ زرێبار ﷼ دریاچە

**زریز** / z(i)rîz/: ☜ **زریشك**

**زریزان** / z(i)rîzan/: ☜ **زوان ـ٢**

**زریزانە** / z(i)rîzane/: ناو. گیایەكە لە ناو گەنمـدا دەڕوێ و بۆ گەنم زیانی هەیە ﷼ گیاه آفت گندمزار

**زریزە** / z(i)rîze/: نـاو. زنجیرۆكەی زۆر باریـك ﷼ زنجیر بسیار باریک

**زریسك** / z(i)rîsk/: ☜ **زریشك**

**زریشك** / z(i)rîşk/: نـاو. زریسـك؛ دڕكـەزی؛ زێ؛ زی؛ زریـز: ١. دەوەنێكـی دڕكاوییـە بـە گوڵـی زەردی هێشـوویی و بـەری خـڕی سـوورەوە ٢. بەری ئەو دەوەنە كە خڕ و تـرش و خۆراكییـە ﷼ ١و ٢. زرشک

**زریشكپلاو** / z(i)rîşkp(i)ław/: نـاو. جۆرێ پـلاوە، كە گۆشت (زۆرتـر گۆشـتی مریشـك)، زریشـك و زافەرانی تێكەڵە ﷼ زرشک‌پلو

**زریشكی**[1] / z(i)rîşkî/: نـاو. ڕەنگـی سـووری ئامـاڵ كەوە ﷼ زرشكی

**زریشكی**[2]: ئاوەڵناو. بە ڕەنگی زریشك ﷼ زرشكی

**زریڤان** / z(i)rîvan/: نـاو. گەمیەوان؛ ئەوی لە سەر گەمی كار دەكات ﷼ كشتیبان

**زریقەوبریقە**/ z(i)rîqewb(i)rîqe/: ☜ **زەرقوبەرق**

**زریقوبریق** / z(i)rîq û b(i)rîq/: ☜ **زەرقوبەرق**

**زریك** / z(i)rîk/: ☜ **زریكە**

**زریكان** / z(i)rîkan/: چاوگ. زریكاندن؛ زریكیـای؛ قیژاندن ﷼ جیغ كشیدن

**زریكانـــدن** / z(i)rîkandin/: چـــاوگ. تێپـــەڕ. //زریكانـدت؛ دەزریكـێنی؛ بزریكێنـە// زیكانـدن؛ زیكانن؛ زیكنای: ١. زیقاندن؛ زیـقوهـۆڕ كـردن؛ قیژانـدن؛ باسـنەی؛ گریـان بـە قیـژە و هـەراوە (بەتایبەت مندال) ٢. چڵ وەشاندن؛ چریسكە پێدا

هاتنی ئەندام ▭ ۱. زار زدن ۲. تیر کشیدن اندام
■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـــ/ چاوگی نەرێنی: نەزریکاندن

**زریکنای** / z(i)rîknay/: ☜ **زریکاندن**

**زریکە** / z(i)rîke/: ناو. زریک؛ زیکە: ۱. قیژە؛ هاواری تیژو باریک ۲. چڵ؛ چریسکە ▭ ۱. جیغ ۲. حالت تیر کشیدن اندام

**زریکیای** / z(i)rîkyay/: ☜ **زریکان**

**زریلە** / z(i)rîle/: ناو. سریلە ▭ چکاوک شاخدار

**زریمزروک** / z(i)rîmz(i)ruk/: ناو. جۆرێ چۆلەکەی دەشت ▭ از انواع گنجشک

**زرینچک** / z(i)rînçik/: ☜ **زرینچکاو**

**زرینچکاو** / z(i)rînç(i)kaw/: ناو. زرینچک؛ زەرداوی برین ▭ زردابەی زخم

**زرینگ**[1] / z(i)rîng/: ناو. زرنگ؛ ڕۆنی زەنگ؛ ڕۆنی تاواوە ▭ روغن تفیدە

**زرینگ**[2]: ئاوەڵناو. زرنگ؛ زیت؛ زیتەڵ؛ زبت؛ زرک؛ زیکل: ۱. وریا؛ وشیار؛ شووت؛ هلدایی؛ هەوار؛ کۆنا؛ زیرەک؛ وتە؛ قوتە؛ بە هۆش؛ هایا؛ لوکوش؛ ئیار؛ یەمان ۲. مەزبووت؛ بەچنگ؛ گرژ؛ کرژ؛ تروسک؛ لۆبت؛ لۆتەر؛ گورد؛ بەکار؛ خەیرا؛ چابک؛ چالاک؛ چەنگ‌چیل؛ جەلد؛ تیژ و توار؛ تەوار؛ تیار؛ بزۆز؛ ئازا؛ قۆچاخ ۳. گورد؛ گورج؛ گوربز؛ چەلەنگ ▭ ۱تا۳. زرنگ

**زرینگ**[3]: دەنگەناو. زرنگ؛ دەنگی مس و زێڕ و زیو لە کاتی لێک‌کەوتندا ▭ جرینگ

**زرینگان** / z(i)rîngan/: چاوگ. زرنگان: ۱. دەنگ دانەوەی مس و زێڕ و زیو کاتی لێک‌کەوتن ۲. *[مەجاز]* ناو زڕان؛ بێ‌قەدر بوون ▭ ۱. صدا دادن فلزات در افتادن ۲. تشت از بام افتادن

**زرینگانەوە** / z(i)rînganewe/: چاوگ. تێنەپەڕ. //زرینگایەوە؛ دزرینگێیەوە؛ بزرینگێوە// زرنگانەوە؛ زنگین؛ زرینگیایەوە؛ زنگایش: ۱. درنگانەوە؛ دەنگ دانەوەی مس و زێڕ و زیو کاتی لێک‌کەوتن ۲. شەو درەنگ بوون ‹شەو زرینگایەوە، ڕاشکا/ شەیتان سامی لە خوا شکا «هێمن»› ۳. دەنگ لە گوێ هاتن ‹گوێم زرینگایەوە› ٤. پندر/ کزر بوونەوە ٥. دوو جار لە کلدا سوور بوونەوە ▭ ۱. صدا دادن فلزات ۲. پاسی از شب گذشتن ۳. زنگ زدن گوش ۴. نیم خشک شدن تر ۵. دوباره در کوره سرخ شدن (سُفال)
■ ئاوەڵناوی بەرکاری: زرینگاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەزرینگانەوە

**زرینگە** / z(i)rînge/: دەنگەناو. زرنگە؛ دەنگی وێک‌کەوتنی کانزا ▭ جرینگ؛ صدای بهم خوردن فلزات

**زرینگی** / z(i)rîngî/: ناو. زرنگی؛ وریایی؛ مەزبووتی ▭ زرنگی

**زرینگیایەوە** / z(i)rîngyayewe/: ☜ **زرینگانەوە**

**زرینگین** / z(i)ringîn/: چاوگ. زرنگین؛ زرنگە لێ هاتن ▭ صدای جرینگ از چیزی برآمدن

**زریوە**[1] / z(i)rîwe/: ناو. ترووکەی ئەستێرە ▭ سوسوی ستارە

**زریوە**[2]: ئاوەڵناو. زرق‌وبرقی؛ درەوشاوە ‹کراسی زریوە› ▭ زرق‌وبرقی

**زریوە**[3]: دەنگەناو. جریوەی چۆلەکە ▭ جیک‌جیک گنجشکان

**زریوەزریو** / z(i)rîwez(i)rîw/: دەنگەناو. زریوەی یەک لە دوای یەک ▭ جیک ـ جیک پیاپی

**زریە** / zirye/: ☜ **زەریا**

**زرێ** / z(i)rê/: ناو. ۱. زرە؛ زرخ؛ بەرگی شەڕ؛ بەرگێ لە ئالقەی پۆلایی ناسک و باریک کە بۆ بەرگری لە گەزنی تیر و شیر لە شەڕدا دەبەر دەکرا ۲. زرە؛ زرخ؛ پەڕەی پۆلا یا ئالیاژێکی قایم کە ماشین و کەشتی شەڕی پێ دادەپۆشن ۳. ☜ **زەریا** ▭ ۱و۲. زرە ۳. ☜ **زەریا**

**زرێبـار** / z(i)rêbar/: نـاو. زرێـوار: ١. زریچـەـ؛ دەریاچە ٢. ڕەخی زریـا ١. دریاچـه ٢. کرانـەی دریا

**زرێپۆش** / z(i)rêpoş/: ناو. زرێدار: ١. کەسێ کـه زرێی دە بەردایـە ٢. هـەرچی گـولله نایبـڕێ ١و٢. زره‌پوش

**زرێچ** / z(i)rêç/: ناو. چرێش؛ سرێش؛ ئەسرێلک سریشُم

**زرێچە** / z(i)rêçe/: ☜ زرێبار-١

**زرێدار** / z(i)rêdar/: ☜ زرێپۆش

**زرێزانە** / z(i)rêzane/: ناو. ڕیشۆڵەی گوێز و داری لێرەوار کە بەهاران دەریدەکەن و دوایە دەوەرێ الیاف مانند بهاری برخی درختان

**زرێقنای** / z(i)rêqnay/: ☜ زرووقانەوە

**زرێقنـایۆ** / z(i)rêqnayo/: چـاوگ. بریقاندنـەوە درخشیدن

**زرێقیای** / z(i)rêqyay/: ☜ زرووقانەوە

**زرێقیـایۆ** / z(i)rêqyayo/: چـاوگ. بریقانـەوە درخشیدن

**زرێوار** / z(i)rêwar/: ☜ زرێبار

**زرێوان** / z(i)rêwan/: نـاو. کرێکاری لە سەر دەریـا کارگر دریا

**زڕ**[1] / ziř/: نـاو. ١. *[شـوورەیی]* تـڕ؛ بـای دەنگـداری قوون ٢. *[پـلار]* کاری خۆهەڵکێشانی بە درۆ ‹ئـەو قسانە هەموو زڕن! بڕوات پـێ نـەبێ!› ١. گـوز ٢. لاف و گزاف

⊡ **زڕی نـامـایش:** ١. زەنا ــ زەنـا کـردن ٢. *[پـلار]* بێشەرم و شوورەیی بوون ١. شلوغ کردن ٢. بی‌حیا بودن

**زڕ**[2]: ئاوەڵناو. ١. زل؛ گەپ ٢. گوشاد؛ هەراو ٣. بێ بـەر (دار) ‹لاوەکـەم! نـووکی قەڵـەم دڵ دوژمـنی پێ‌هەڵدڕە/ گەر قەڵەم شیوەن نەکا خەڵفە نەمامێکی زڕە «قـانع»› ٤. وشـک؛ برینـگ ٥. لاسـار؛ گوێ‌نەبیس ١. بزرگ؛ گنده ٢. گُشاد ٣. بی‌ثمر ٤. خشک ٥. لجوج

**زڕ**[3]: دەنگەناو. سەڕ؛ دەنگی کەر عر- عر

⊡ **زڕی نـامـایش:** زەڕانـدن؛ سـەڕاندن عر ــ عـر کردن

**زڕ**[4]: پێشوشە. ١. ناتـەنی ‹زڕدایـک؛ زڕبـرا› ٢. ناڕەسەن ‹زڕپنگ؛ زڕگوێز› ٣. ناخۆ ‹زڕکچ؛ زڕکوڕ› ٤. ئیتر؛ هیتر ‹زڕتلی؛ زڕگێزەر› ١. نا ـ ٢. بـدل ٣. ـ خوانده ٤. غیره

**ـ زڕ**[5]: پاشەوشە. ناتەواو؛ چووکە ‹کەوزڕ› بدل

**زڕئاپ** / ziřap/: ☜ زڕمام[1]

**زڕاتەکێوێلە** / z(i)řatekêwîle/: ناو. کارس؛ هەرزن ارزن

**زڕازڕ** / z(i)řaziř/: دەنگەناو. زەڕە؛ سـەڕە؛ دەنگـی کەر عر- عر

**زڕان** / z(i)řan/: چـاوگ. تێەپـەڕ. //زڕای؛ دەزڕێـی؛ بـزڕێ// زڕیـان؛ زڕیـن؛ زڕیـای: ١. بـە خـراپ دەرچوون ‹مس ئەشکێ، نازڕێ «مەسەل»› ٢. بلاو بـوونی نهـێنی ٣. خـەو پـەڕین ٤. تـازە لـک دەرکردنی دار ‹دار زڕابوو سەرمایەکی تووش هات› ٥. ژووژانـەوە؛ کرانـەوە ‹ئـەوی گـەڕا، مێشـکی زڕا «مەسەل»› ١. شهرت بد یافتن ٢. فاش شـدن ٣. پریدن خواب ٤. تـازه جوانـه دادن درخـت ٥. شـکوفا شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: زڕاو/ چاوگی نەرێنی: نەزڕان

**زڕانـدن** / z(i)řandin/: چـاوگ. تێـەپەڕ. //زڕانـدت؛ دەزڕێنی؛ بزڕێنە// ١. درکانـدنی نهـێنی ٢. خـەو پەڕاندن ١. افشا کردن ٢. خواب پراندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەزڕاندن

**زڕانـەوە** / z(i)řanewe/: چـاوگ. تێەپـەڕ. //زڕایـەوە؛ دەزڕێـەوە؛ بزڕێـوە// زڕیانـەوە؛ دەنـگ دانـەوەی وێک‌کەوتنی کـانزا جرنگیـدن؛ بـە هـم خـوردن فلزات

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: زڕاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەزڕانەوە

**زڕاو** / z(i)řaw/: ئاوەڵناو. زڕیاگ: ١. بە خراپ ڕۆیشتوو (ناو) ٢. خەوپەڕیو ‹لە دوای شەوێک، خەوی پچڕپچڕی زڕاو/ لوورەلووری شەمەندەفەر ... «شێرکۆ»› ٣. تازەلکەدەرکردوو ☰ ١. بدنام شده ٢. خواب‌پریده ٣. تازه جوانه داده

**زڕایش** / z(i)řayş/: چاوگ. زرایەنە: ١. زەڕەزەڕ کردن ٢. *[پلار]* زەنا- زەنا و چەقە و گوڕە کردن ☰ ١. عر- عر کردن ٢. شلوغ کردن

**زڕباب** / ziřbab/: ناو. زڕباو؛ زڕباڤ؛ زڕباوک ☰ ناپدری

**زڕباڤ** / zířbav/: ☜ زڕباب

**زڕبان** / zířban/: ☜ زبران

**زڕباو** / zířbaw/: ☜ زڕباب

**زڕباوک** / zířbawk/: ☜ زڕباب

**زڕبرا** / zířb(i)ra/: ناو. برا هەر لە باوک یان هەر لە دایک ☰ برادر ناتنی

**زڕپک** / zířpik/: ☜ زیپکە-١

**زڕپنگ** / zířping/: ناو. زڕەپنگ؛ جۆرێ پنگە زۆر بڵند دەبێ و ناشخورێ ‹لەرم دی زاهید، ئەم زستانە، زانیم/ کلک نادا بە زڕپنگی بەهارا «مەحوی»› ☰ گیاه بدل پونه

**زڕت**[١] / zířt/: ناو. ١. *[پلار]* کاری خۆ هەڵکێشانی بە درۆ ٢. شیڕ؛ تڕ بە دەم ٣. هەڕەشە؛ گەف ☰ ١. لاف ٢. شیشکی ٣. تهدید

⊡ **زڕت دان**: ١. *[پلار]* خۆ هەڵکێشان بە درۆ ٢. قسەی بێتام کردن ☰ ١. لاف زدن ٢. یاوه گفتن

**زڕت کێشان**: شیڕ بۆ داهێشتن ‹ڕۆژێک لە چاوشی شێخ، واتا کاربەدەستی بارەگام پرسی: ئایا ڕاستە گۆشت بکەویتە بەر سێبەری مەرقەد ئاگر کاری لێ ناکا؟ زڕتێکی زۆر زەلامی بۆ کێشام! «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ شیشکی بستن

**زڕت**[٢]: ئاوەڵناو. زل؛ گەپ؛ زەلام ☰ گُنده

**زڕت**[٣]: ئاوەڵکار. فرت؛ لە پڕا ‹هەر کێشام زڕت قرتا!› ☰ زرتی

**زڕت**[٤]: دەنگەناو. دەنگی وەک دادڕانی پارچە ☰ زرتی

**زڕتک**[١] / zířtik/: ناو. *[شوورەیی]* کونی قوون ☰ پیزی

**زڕتک**[٢]: ئاوەڵناو. *[پلار]* ١. زلحوڵ ٢. زڕتۆک؛ خۆهەڵکێش ☰ ١. لندهور ٢. لافزن

**زڕتلی** / zířt(i)lî/: ناو. شەشە؛ ئەوی شەش قامکی لە دەستێکیدا هەیە ☰ شش انگشتی

**زڕتۆ** / zířto/: ئاوەڵناو. *[پلار]* تەژەی خوێنتاڵ ☰ لندهور

**زڕتۆک** / zířtok/: ئاوەڵناو. *[پلار]* زڕتک؛ خۆهەڵکێش ☰ لافزن

**زڕتۆڵ** / zířtol/: ناو. زڤار؛ تیتۆڵ؛ بزگوڕ ☰ لتە؛ کهنه

**زڕتەزڕت** / zířtezířt/: ناو. وەرامی کەسێ کە قسەی بێتام دەکا ☰ جواب یاوه‌گو

**زڕتەزەلام** / zířtezelam/: ئاوەڵناو. *[پلار]* زەلامی بێقەبارە ‹کابرایەکی زڕتەزەلامی سوورهەڵ، دەتگوت بەرازی دابەستراوە، دەرگەی کردەوە ... «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ لندهور

**زڕتەک** / zířtek/: ئاوەڵناو. خۆهەڵکێشی بێتام ☰ لافزن

**زڕتی** / zířtî/: ئاوەڵناو. *[پلار]* خوێڕی و بێکارە ☰ هرزه و بیکاره

**زڕجان** / zířcan/: ئاوەڵناو. *[پلار]* ١. بە درۆ خۆهەڵکێش ٢. جنێوفرۆش ☰ ١. لافزن ٢. فحاش

**زڕچایش** / zířçayiş/: ☜ زڕچایەنە

**زڕچایەنە** / zířçayene/: چاوگ. زڕچایش؛

نەڕاندن؛ گوڕڕە و هەرا کردن ◘ داد زدن

**زڕچۆنە** / zirçone/: ئاوەڵناو. *[پلار]* بێ نرخ ◘ بی‌ارزش

**زڕخوشک** / zirxuşk/: ناو. زڕخوەه؛ زڕخۆینک؛ خوشکی هەر لە باب یان هەر لە دایک ◘ خواهر ناتنی

**زڕخوەه** / zirx(i)weh/: ☜ **زڕخوشك**

**زڕخۆسسی** / zirxossî/: ☜ **زڕخەسوو**

**زڕخۆینک** / zirxoynik/: ☜ **زڕخوشك**

**زڕخەزوور** / zirxezûr/: ناو. زڕبابی هاوسەر ◘ ناپدری همسر

**زڕخەسوو** / zirxesû/: ناو. زڕخۆسسی؛ زڕدایکی هاوسەر ◘ نامادری همسر

**زڕخەو** / zirxew/: ئاوەڵناو. خەوزڕاو ‹تازە زڕخەو بووە، خەوی لێ ناکەوێتەوە› ◘ خواب‌آشفته

**زڕداک** / zirdak/: ☜ **زڕدایك**

**زڕدایک** / zirdayk/: ناو. زڕداک؛ زڕماک ◘ نامادری

**زڕدش** / zirdiş/: ☜ **زڕدوش**

**زڕدوش** / zirduş/: ئاوەڵناو. زڕدش؛ زڕخوشکی شوو ◘ ناخواهری شوهر

**زڕدەلوێ** / zirdel(i)wê/: ☜ **زڕدەلی**

**زڕدەلی** / zirdelî/: ئاوەڵناو. *[پلار]* زڕدەلوێ؛ شێتۆکە و دەبەنگی مێوینە ◘ دیوانه‌مزاج (زن)

**زڕڕەک** / zirrek/: ئاوەڵناو. *[پلار]* نەزان؛ نەفام ◘ نفهم

**زڕ ـ زڕ** / zir zir/: دەنگەناو. *[پلار]* دەنگی گریانی زبر و بەقەو ◘ صدای بلند و خشن گریه

**زڕزڕە**[1] / zirz(i)re/: ناو. خڕخاشە؛ خشخشە ◘ خشخشه (اسباب‌بازی)

**زڕزڕە**[2]: دەنگەناو. دەنگی لێک کەوتنی ئاڵقەی زنجیر ‹زۆر دەمێکە چاوەڕوانی زڕزڕەی زنجیر ئەکەم/ سەیری ئەم زنجیرە کەن وەک زێوەری شاهانەیە «قانع»› ◘ صدای به هم خوردن حلقه‌های زنجیر

**زڕزۆپ** / zirzop/: ئاوەڵناو. *[پلار]* بێ‌ئابڕوو؛ بێ‌شەرم ◘ بی‌حیا

**زڕفستق** / zirfistiq/: ناو. بادامەزەمینە ◘ بادام‌زمینی

**زڕقتک** / zirqitik/: ☜ **زڕقتی**

**زڕقتکی** / zirqitkî/: ☜ **زڕقتی**

**زڕقتی** / zirq(i)tî/: ناو. زڕقتک؛ زڕقتکی؛ زڕکتک؛ زلقتی؛ زەردەواڵە؛ مێروویەکی چکۆلەی چزووداره پێوەدەدا ◘ موسه؛ نوعی زنبور

**زڕک** / zirk/: ناو. زڕکە؛ حەنجۆر؛ خرچە؛ قەرە خرچە؛ گندۆرەی کاڵ ◘ خربُزه‌ی نارسیده

**زڕکتک** / zirk(i)t(i)k/: ناو. زڕکێتک: ۱. زڕقتی؛ زەردەواڵە ۲. باڵدارێکی زەردی چکۆلەیە لە قەناری دەکا ◘ ۱. موسه؛ نوعی زنبور ۲. پرنده‌ای شبیه قناری

**زڕکچ** / zirkiç/: ناو. زڕکەچ؛ کچی مێرد بۆ باوەژن یان کچی ژن بۆ باوەپیارە ◘ نادختری

**زڕکوڕ** / zirkur/: ناو. کوڕی ژن بۆ زڕباب یان کوڕی پیاو بۆ زڕدایک ◘ ناپسری

**زڕکۆ** / zirko/: ناو. گزرە؛ گیای گێرەکراو ◘ گیاه کوبیده

**زڕکە** / zirke/: ☜ **زڕك**

**زڕکەتاڵ** / zirketał/: ☜ **زەرەند**

**زڕکەچ** / zirkeç/: ☜ **زڕکچ**

**زڕکێتک** / zirkêtik/: ☜ **زڕکتك**

**زڕگوێز** / zirg(i)wêz/: ناو. زەرگۆز؛ دارێکە لە گوێز دەکا و بەر ناهێنێ ◘ درختی گردوسان بی‌ثمر

**زڕگێزەر** / zirgêzer/: ناو. گیایەکی دەشتە بنەکەی لە گێزەر دەکا ◘ گیاهی شبیه هویج

**زڕگێژنۆک** / zirgêjnok/: ناو. شەوکەران؛ شۆکەران؛ دووڕەست؛ مارەکوشە؛ ڕوەکێکە لە تیرەی گێزەر، بە گوڵی چەتری، سپی و قەد سەوزی پنکە ـ پنکە سوورەوە کە توێکڵەکەی بۆ

دەماخ کردن بە کار دێ ☰ شوکران

**زڕماک** / zirmak/: ☜ **زڕدایك**

**زڕمام**[1] / zirmam/: ناو. زڕئاپ: ١. زڕ بـرای بـاوک ٢. بـرای باوەپیـارە ☰ ١. عمـوی نـاتنی ٢. بـرادر ناپدری

**زڕمام**[2]: ناوەڵناو. شێت ☰ دیوانە

**زڕمێشەسی** / zirmêşesî/: ☜ **زڕەچرگ**

**زڕنا** / zirna/: ☜ **سڕنا**

**زڕنـازیق** / zirnazîq/: نـاو. جۆلانــێ؛ دێلــەکانێ ☰ تاب‌بازی

**زڕنـاژەن** / zirnajen/: نـاو. زڕنا لێدەر؛ ژەنیاری زڕنا ‹زڕنـاژەن بـێ، شـایی کـوڕی بـێ «مەسـەل»› ☰ سُرناچی

**زڕنـای** / zirnay/: چاوگ. ١. زڕاندن؛ خەو شێواندن ٢. تاراندن؛ تەرە کـردن ☰ ١. از خـواب پرانـدن ٢. رَماندن

**زڕندی** / z(i)rindî/: ناو. لوولە؛ بۆری؛ بۆریە ☰ لولە

**زڕنوچقاو** / zirnûçqaw/: ☜ **زڕنوقاو**

**زڕنـووق** / zirnûq/: نـاو. چریسـکایی ڕۆن لـە سـەر شۆرباو ☰ چربی کم روی سوپ

**زڕنـوقاو** / zirnûqaw/: ناو. زڕنووچقـاو؛ چـەوراییی کەم بە سەر چێشتی تـراوەوە ☰ چربـی کـم روی غذای آبکی

**زڕنە** / zirne/: ناو. کاری زەنـگ لـێ دان ☰ عمـل زنگ اخبار زدن

**زڕنەڤان** / zirnevan/: ☜ **سڕناژەن**

**زڕنەقوتە** / zirnequte/: ☜ **زەڕنەقوتە ـ٢**

**زڕواڵێ** / zirwałê/: ناو. زڕخوشک ☰ ناخواهری

**زڕوان** / zirwan/: ناو. بیابان؛ بیاوان ☰ بیابان

**زڕوزبیل** / zir û z(i)bîl/: ناو. زبڵوزاڵ ☰ آشغال

**زڕوزەنگیانە** / zir û zeng(i)yane/: ناو. مت‌ومـووروو ☰ خرزە و منجوق

**زڕە**[1] / z(i)re/: دەنگـەناو. ١. دەنگــی ڕاتلــەکانی زنجیر و ... ‹زڕەی زنجیر› ٢. سەڕەی کەر ☰ ١. جرنگ ٢. عرـ عر الاغ

**زڕە**-[2]: پێشوشە. [پلار] ١. زل؛ گەپ ‹زڕەمار› ٢. زڕـ؛ ناجسن؛ پێچەوانەی ڕەسەن ‹زڕەسەیی› ٣. زڕـ؛ بێ بەر (بـۆ دار) ‹زڕەبـادام› ☰ ١. بـزرگ؛ گنـدە ٢. نااصل ٣. بی‌ثمر

**زڕەباوێشک** / z(i)rebawêşk/: ناو. [پلار] باوێشـکی زل و زۆر ☰ خمیازەی شدید و متوالی

**زڕەبلبل** / z(i)rebilbil/: ☜ **زڕەبولبول**

**زڕەبولبـول** / z(i)rebulbul/: ناو. زڕەبلبل؛ جۆرێـک باڵندەیە لە خێزانی بولبولەکان سەر بە تۆرەمەی ڕەشیشـە، نزیـک ١٥ سـانتی‌میتـرە، نێـر و مـێ یەکڕەنگ، بە لەشی باریک و لاقی درێژ، کلکـی شێ ڕەنـگ کـە وەک چـەتر هەڵـیدەدا، سـەری بەڵەک، پشتی قاوەیی ئاماڵ بـۆر و بـرۆی ئامـاڵ سـپییە، لـە هەڵنیشـتندا باڵـی کـەمێک شـۆڕ ڕادەگرێ و کلکی قیتی دەجووڵـێنێ، لـە بـاخ و ڕەزاندا دەژی و لە نێو پـەرژین و سـەر دارەگـەز هێلانە دەکا، هاوینان زۆرە ☰ بلبل دُم‌چتری

**زڕەبیـزا** / z(i)rebîza/: نـاو. گیایـەکی کوێسـتانی لاسقەک ڕەقە ☰ گیاهی است

**زڕەپنگ** / z(i)reping/: ☜ **زڕپنگ**

**زڕەپـۆڕ** / z(i)repor/: نـاو. جۆرێـک باڵـندەیە لـە تۆرەمەی قەرقاوڵ، نزیک ٢٩ سانتی‌میترە، نێـر و مێی یەکڕەنگە، پشتی قاوەیی مەیلەو بۆری ڕێ ـ ڕێ و بەر زگی قاوەیی مەیلەو زەردی ڕێ ـ ڕێ و چەنە و گەرووی زەردی کـاڵ و لاقـی سـوورە، کردەوەی لە پۆڕ دەچێ، لە سـەر زەوی، لـە ژێـر پنچ و قوپەن هێلانە ساز دەکا ☰ جیرفتی

**زڕەتـو** / z(i)retû/: نـاو. توێلک؛ جۆرێ دارەتـوو ☰ از انواع درخت توت

**زڕەچـــرگ** / z(i)reçirg/: نــاو. زڕەچێـــــرگ؛ زڕمێشەسـی؛ زڕەمێشەسـی؛ تـۆدەرە؛ هـۆورە؛

هۆوەرە؛ ڕاوارە؛ باڵندەیەکە لە تۆرەمەی چرگ، نزیکی ٦٢ سانتیمیتر دەبێ، لە بۆقلەی مێ دەکا، کلک و ملی خورمایی ڕەنگە، یاڵ و بژی بەڵەکە و بە هەر دوو لاملیدا هاتۆتە خوارێ، پشتی قاوەیی کاڵی پنۆک ـ پنۆک، بەر زگی سپی و ملی بۆر و شاباڵی ڕەشە، چاوی گەورەن، لە فڕیندا تەپە، لە بەیار و دەشتان دەبینرێ 🗺 هوبره

**زڕەچێرگ** / z(i)řeçêrig/: ☜ **زڕەچرگ**

**زڕەخەو** / z(i)řexew/: ناو. خەوی کەم و سووک 🗺 خواب اندک و سبُک

**زڕەزڕ** / z(i)řeziř/: دەنگەناو. دەنگی زڕەی زۆر 🗺 زر- زر

**زڕەق** / z(i)řeq/: ☜ **زڕوق**[۲]

**زڕەقیان** / z(i)řeqyan/: چاوگ. کەنینی ساوا بە دەنگ 🗺 قهقه زدن کودک

**زڕەک** / z(i)řek/: ئاوەڵناو. ۱. *[پلار]* هەقمەق ۲. *[پلار]* شەڕفرۆش ۳. وشکاو؛ وشک 🗺 ۱. احمق ۲. ستیزەجو ۳. خُشک

◻ **زڕەک بوون**: زڕە بوون؛ بە شەوارە کەوتن 🗺 نور در چشم افتادن

**زڕەکەش** / z(i)řekeş/: ناو. کەشاوی کزرەوە بوو و ئامادەی کێلان 🗺 زمین آبداده و آمادەی کشت

**زڕەکەو** / z(i)řekew/: ناو. زەڕەکەو؛ جرەکەو؛ کەواچوو؛ کەواچیر؛ کەوزڕ؛ سوورەباڵە؛ باڵندەیەکە لە تۆرەمەی قەرقاوڵ، نزیک ۳۰ سانتیمیتر دەبێ، باڵ و کلکی کورت و خورمایی ڕەنگە، بەر زگی نێرەکانی خاڵی قاوەیی لێیە، هی مێ کاڵترە، سەر پشتی ڕێ ـ ڕێیە، هەرکە هەستی بە مەترسی کرد خۆ بە عەرزەوە مەلاس دەکا و ئامادەی فڕین دەبێ، لە شیناوەرد، بەیار، لەوەڕگە و ... دەبینرێ، هێلانەی لە شوێنی ئەستەم و حەشارگەی وەک پەرژین، ناو گەنمەجاڕ و گەنمەشامیدا ساز دەکا 🗺 کبک چیل

**زڕەلاو** / z(i)řelaw/: ناو. ۱. *[پلار]* لاوی ترسەنۆک ۲. گیایەکە قالۆری هەیە و ڕەنگی سپییە، زۆر بەرز دەبێتەوە و لە نێو قۆپیدا شین دەبێ 🗺 ۱. جوان ترسو ۲. گیاهی است

**زڕەمار** / z(i)řemar/: ناو. ماری زۆر زل 🗺 مار بسیار بزرگ

**زڕەمازوو** / z(i)řemazû/: ناو. ویول؛ دارێکی دارستانە لە دار مازوو دەکا 🗺 درختی جنگلی شبیه مازوج

**زڕەمەندی** / z(i)řemendî/: ناو. بەلبەلەشوانە؛ زیزڕەمەندێ؛ زڕەمەندێ؛ گیایەکە وەک مەندێ بەلام کورتەبالاتر و گەلاوردترە 🗺 گیاهی است

**زڕەمەندێ** / z(i)řemendê/: ☜ **زڕەمەندی**

**زڕەمێر** / z(i)řemêr/: ☜ **زرت**[۲]

**زڕەمێشەسی** / z(i)řemêşesî/: ☜ **زڕەچرگ**

**زڕهگ** / ziřhig/: ناو. چرگ؛ چێرگ؛ مێشەسی 🗺 هوبره؛ میش‌مُرغ

**زڕیاگ** / ziřyag/: ئاوەڵناو. ۱. ☜ **زڕاو** ۲. ☜ **زڕوقاو** ۳. ڕاتلەکاوی دەنگ‌لێ‌هاتوو (زنجیر و ...) 🗺 ۱. ☜ **زڕاو** ۲. ☜ **زڕوقاو** ۳. تکان داده شده و به صدا افتاده

**زڕیان** / ziřyan/: ☜ **زڕان**

**زڕیانەوە** / ziřyanewe/: ☜ **زڕانەوە**

**زڕیای** / ziřyay/: چاوگ. ۱. ☜ **زڕان** ۲. وشک بوونەوە 🗺 ۱. ☜ **زڕان** ۲. خُشک شدن

**زڕین** / z(i)řîn/: ☜ **زڕان**

**زسان** / z(i)san/: ☜ **زستان**

**زستان** / zistan/: ناو. زسان؛ زڤستان؛ زمسان؛ زمستان؛ زمستون؛ زمستوو؛ زمسوو؛ زۆسان؛ زووسان؛ جسان؛ جستان: ۱. یەکێ لە چوار وەرزی ساڵ لە وڵاتانی مامناوندی، کە کەوتۆتە نێوان پاییز و بەهارەوە ۲. *[کینایە]* وەرز و چاخی سەرما و سۆڵە ‹لەم ناوچە هێشتا سەرماوەز

نەهاتووە، زستان دەست پێ‌دەکا› ▤ ١و٢. زمستان
◙ **زستانی ناوکی**: زستانی ئەتومی؛ بارودۆخێ کە ئەگەر شەڕی ناوکی بقەومێ، ڕوو دەدا و بە هۆی تۆز و دووکەڵی یەکجار زۆرەوە بەر تیشکی خۆر دەگیرێ، دنیا دەرچێ و قالبی ژیان دەبڕێتەوە ▤ زمستان هستەای
**زستانە** / zistane/: ☜ **زستانی**
**زستانەخەو** / zistanexew/: ناو. خەوی زستانانی بڕێ لە گیانەوەران ▤ خواب زمستانی
**زستانەزێ** / zistanezê/: ئاوەڵناو. ١. لە زستاندا زاو ٢. لە زستاندا لە دایک بوو ▤ ١. زاییده در زمستان ٢. زاده شُده در زمستان
**زستانەوار** / zistanewar/: ناو. گەرمەسێر؛ جێ ژیانی کۆچەر لە زستاندا ▤ قشلاق
**زستانەیی** / zistaneyî/: ☜ **زستانی**
**زستانی** / zistanî/: ئاوەڵناو. زستانە؛ زستانەیی؛ زمسانە؛ زمسانی؛ زمستانی؛ پێوەندیدار بە زستانەوە ‹پێڵاوی زستانی› ▤ زمستانی
**زشت** / zişt/: ئاوەڵناو. کەسن؛ کرێت: ١. ناپەسند ٢. ناحەز؛ ناشیرین ▤ ١و٢. زشت
**زشتی** / ziştî/: ناو. کرێتی؛ کەسنی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ناشیرین و ناحەز بوون ▤ زشتی
**زغاڵ** / z(i)ğał/: ☜ **خەڵوز**
**زغاڵدان** / z(i)ğałdan/: ☜ **خەڵوزان**
**زغاڵدوو** / z(i)ğałdû/: ☜ **خەڵوزان**
**زغرک** / ziğrik/: ☜ **زخور**
**زغرگ** / ziğrig/: ☜ **زەگر**
**زفت** / zift/: ناو. زەفت؛ زەفتە؛ قیری سروشتی؛ ماکێکی هیدرۆکەربونی کە وەک هەویرێ لە کەلێنی بڕێ بەردەوە دەدەڵێت و بۆ دەرمان بە کار دێت ▤ زفت
◙ **زفت لێدان**: زەفتە لێدان؛ ساوینی زفت بە سەر پارچە و لکاندنی بە سەر شوێنێک لە لەشدا بۆ دەرمان ▤ زفت انداختن
**زفتک** / ziftik/: ناو. زیپکەی عازەوی کە لە ڕووی تازەلاوان پەیدا دەبێ ▤ جوش غرور
**زفتە** / zifte/: ئاوەڵکار. زۆرتر ‹ئێمە کەم ئەچین بۆ مالیان، زفتە ئەوان تێن› ▤ اکثراً؛ بیشتر
**زفتی** / ziftî/: ناو.[کۆن] فەرمانبەری دارۆغە ▤ مأمور داروغه
**زفر** / zifr/: ناو. وردە و پردەی پەرژبووی ورکەنان و گرار ▤ ریزه نان و غذای پسمانده در سُفره
**زفقێل** / zifqêl/: ناو. سەردەرانەی ماڵ ▤ سردر خانه
**زڤار** / z(i)var/: ☜ **زرتۆل**
**زڤار ـ زڤار** / z(i)var z(i)var/: ئاوەڵناو. شڕ و وڕ؛ لەت‌وپەت ▤ لت‌وپار
**زڤاڤ** / z(i)vav/: ناو. جۆرێ گاسن ▤ نوعی گاوآهن
**زڤان** / z(i)van/: ناو. ١. جووچکەی مریشک؛ جووجەڵەی مامر ٢. زوان؛ زمان ▤ ١. جوجەی مُرغ ٢. زبان
**زڤران** / zivran/: ☜ **زڤڕین**
**زڤراندن** / zivrandin/: ☜ **زڤڕین**
**زڤرک** / zivrik/: ناو. ژەنگەسوورە؛ شەنگەسوورە؛ سوورەمۆزە؛ مێرووییەکی سوور و زەردی چزووداری لە زەرگەتە زلترە ▤ زنبور سرخ
**زڤرین** / zivrîn/: ☜ **زڤڕین**
**زڤڕ** / zivř/: ناو. ١. خول؛ سوور ٢. کاری گەڕانەوە؛ بەرەو دوا هاتنەوە ▤ ١. چرخش ٢. برگشت
**زڤڕان** / zivřan/: ☜ **زڤڕین**
**زڤڕۆک** / zivřok/: ناو. گێژاو؛ ئاشی جندۆکان ▤ گرداب
**زڤڕین** / zivřîn/: چاوگ. زڤڕان؛ زڤران؛ زڤرین؛ زڤراندن: ١. خول خواردن ٢. گەڕانەوە؛ بەرەو دوا

هاتنەوە ▪ ۱. چرخیدن ۲. برگشتن

**زڤڕینـــەوە** / zivřînewe/: چـــاوگ. ڤـــــەگەڕیان؛ گەڕانەوە ▪ بازگشتن

**زڤستان** / z(i)vistan/: ☜ **زستان**

**زڤل** / zivl/: ☜ **زابوق**

**زڤنگ** / z(i)ving/: نـاو. ۱. ئەشـــکەوت؛ هلـــۆڵ و ڕەهۆڵی سروشتی لە کێودا ۲. زســتانە هــەوار ▪ ۱. غار ۲. قشلاق

**زڤیر** / zivîr/: ☜ **زویر**

**زڤیرک** / zivîrik/: ناو. گێژەڵووکە؛ گـەردەلوول ▪ گردباد

**زق**[۱] / ziq/: ناو. ۱. هەڵـمات؛ تەشـبەرە ۲. چـەلاو ‹بەوێدا مەچۆ زقە ئەچەقی› ▪ ۱. تیلە ۲. باتلاق

**زق**[۲]: ئاوەڵناو. ۱. ☜ **زەق** ۲. چەلاوی ‹ئەم زەوییە زقە، خەتەرە!› ▪ ۱. ☜ **زەق** ۲. باتلاقی

**زقـاف** / z(i)qaf/: نـاو. خێشـک؛ ماڵـە؛ ئامرازێکـە شێوەردی پێ لێـک و لـووس دەکـەن ▪ ماڵـەی صاف کردن زمین زراعی

**زقاق** / z(i)qaq/: ناو. کۆڵان؛ تاخ؛ کووچە ▪ کوچە

**زقان** / z(i)qan/: ناو. خلماتان؛ هەڵـماتان؛ ماتـان؛ مێشان؛ پلان ▪ تیلەبازی

**زقاو** / z(i)qaw/: نـاو. زەقاو؛ تەڕەزن؛ ئاوێ کە لـە قەراغ مێرگـەوە دەدەڵـێ ▪ آبـی کـە از کنـارەی چمنزار به بیرون می‌تراود

**زقل** / ziql/: ناو. قسڵ؛ کلس ▪ آهک

**زقلی** / ziqlî/: ئاوەڵناو. قسلی؛ ئاهەکی ▪ آهکی

**زقوزوا** / ziq û z(i)wa/: ئاوەڵـناو. وشـکـوبـڕین؛ تەواو وشک؛ فرە زوها ▪ کاملاً خشک

**زقوم** / z(i)qum/: ☜ **زوقم ـ۱**

**زقـوم** / ziqûm/: ئاوەڵـناو. *[کینایـە]* زۆر تـاڵ، وەک ژەهری مار ▪ بسیار تلخ

▣ **زقوم نایش:** بە قوزەڵقورت بـوون؛ بـە زەهـری مار بوون ▪ کوفت شدن

**زک** / zik/: ☜ **زگ**

▣ **زکی برسی:** زگی هیچ تێدا ▪ شکم گرسنە

**زکی پێ:** قووڵایی ناوەندی بەری پا ▪ قوس پا

▣ **زک بـوون:** *[کینایـە]* منـاڵ لـە سـکدا هـەبوون؛ دووگیان بوون ‹براژنم زکی هەیە› ▪ باردار بوون

**زک بـەردان:** *[مـەجاز]* زۆر خـــواردن ▪ پُرخـوری کردن

**زک پڕ بوون:** *[کینایـە]* ئـاوس بـوون ‹دووجـار لـە مێردەکەی زکی پڕ بووە› ▪ حاملە بودن/ شدن

**زک پـێچ دان:** *[مــەجاز]* برســـێتی کێشـــان ▪ گرسنگی کشیدن

**زک پێسوتان:** ☜ **زگ پێسوتان**

**زک پێشەوتین:** ☜ **زگ پێسوتان**

**زک تـاو دان:** *[مەجاز]* بە هیوای شتێک، بەتایبەت خواردەمــەنی بـوون ‹زکـت تـاو مـەدە! جـارێ خەبەرێ لە نان نییـە!› ▪ شـکم خـود را صـابون زدن

**زک چوون:** *[مەجاز]* زک ڕۆین؛ زک کار کردن؛ پـا کار کردن ▪ اسهال شدن

**زک دان:** زگ داین؛ سـک دان؛ گـوپ دان؛ لـەم دای؛ دەرپەڕینی بەشی ناوەڕاستی شـتێک بـە هۆی خراپ بوونـەوە ‹دیوارەکـە زکـی داوە› ▪ شکم دادن

**زک دڕین:** زگ دڕین: ۱. چەقۆ یان هـەر شـتی تیژ بە سـکدا کـردن ۲. *[کینایـە]* زۆر لایـەنگری شتێ یان کەسێ بوون و لە سەر کردنەوە ▪ ۱. شکم پارە کردن ۲. شکم (برای کسی) دریدن

**زک ڕۆین:** ☜ **زک چوون**

**زک سوتان:** *[مەجاز]* جەرگ سووتان؛ مناڵ مردن ▪ فرزند مُردن

**زک کار کردن:** زگ کار کـردن؛ دڵ کـار کـردن؛ دەرکردنی پیسـایی لـە ڕیخۆڵـە ▪ شـکم کـار کردن

**زک کردن:** *[مەجاز]* منداڵ هێنان ⇐ بچه آوردن

**زک لەوەڕاندن:** *[پلار]* چڵێسی کردن؛ ماڵەوماڵ کردن بۆ خواردن ⇐ سورچرانی کردن

**زکئێشە** / zik'êşe/: ناو. زکێشە؛ سکێشە؛ دەردی ناو زک ⇐ شکم‌درد

**زکبەل** / zikbel/: ئاوەڵناو. *[پلار]* زکزل؛ زگهۆڕ؛ ورگن؛ تەنگەئەستوور ⇐ شکم‌گُنده

**زکپڕ** / zikpiř/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* دووگیان؛ زگپڕ ⇐ حامله؛ باردار

**زکتێر** / ziktêr/: ئاوەڵناو. نەبرچی ⇐ سیر

**زکتێڕ** / ziktêř/: ☜ **زگەڕۆ**

**زکچک** / zikçik/: ناو. والایی لە ناو دڵدا ⇐ بطن قلب

**زکدڕاو** / zikd(i)řaw/: ☜ **زگەڕۆ**

**زکدێلک** / zikdêlik/: ناو. جۆرێ ماسی ⇐ نوعی ماهی

**زکر** / zikr/: ناو. کار و ڕەوتی پرچ هەڵسووڕان و هەڵپەڕ و داپەڕی دەروێشان ⇐ سماع و پایکوبی درویشان

**زکڕەش** / zikřeş/: ئاوەڵناو. *[پلار]* دەبنەوەبڕ؛ ڕکوونی؛ ڕقلەزک ⇐ کینه‌ای

**زکڕەقی** / zikřeqî/: ناو. دەردەکۆپانە؛ کوزاز؛ نەخۆشینێکی چڵکییە لە چەشنێ باکترییەوە سەرهەڵدەدا و دەبێتە هۆی ڕەگ گیران و کرژ بوونەوەی ماسوولکەی لەش ⇐ کُزاز

**زکزل** / zikzil/: ☜ **زگزل**

**زکسووتاو** / ziksûtaw/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* زکشەوات؛ کۆس کەفتگ؛ منداڵمردوو ⇐ فرزندمُرده

**زکشەوات** / zikşewat/: ☜ **زکسوتاو**

**زکقوپاو** / zikqupaw/: ئاوەڵناو. کەلەکەقوپاو؛ لەڕ و لاواز ⇐ لاغر

**زککور** / zikkûr/: ☜ **زگەڕۆ**

**زککێشکی** / zikkêşkî/: ناو. سکەخشێ؛ کار و ڕەوتی لە سەر زگ خزین ⇐ بر شکم خزیدن

**زکگرتی** / zikgirtî/: ناو. قەبزی؛ پندری ⇐ یبوست

**زکگیری** / zikgîrî/: ناو. دۆخی قەبز بوون؛ دژی ڕەوانی ⇐ حالت یبوست داشتن

**زکلەوەڕێن** / zikleweřên/: ئاوەڵناو. *[پلار]* زگلەوەڕێن؛ سکەڕۆ؛ چەورە؛ چڵێس ⇐ شکمباره

**زکماک** / zikmak/: ☜ **زگماك**

**زکماگی** / zikmagî/: ئاوەڵناو. سکماکی؛ ئێرسی ⇐ مادرزادی

**زکمانگ** / zikmang/: ☜ **زگماك**

**زکن** / z(i)kin/: ☜ **زگەڕۆ**

**زکنەکەر** / zikneker/: ئاوەڵناو. نەزۆک؛ نەزا ⇐ نازا

**زکوزا** / zik û za/: ☜ **زاوزو**

**زکوزاکەر** / zik û zaker/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی ژنێ کە لە زان ناوەستێ ⇐ زایا

**زکوێن** / zikwên/: ناو. سکبەن؛ شاڵێکی پانی پارچەیی بە ئالقەزوونەوە بۆ بەرگری لە داچۆڕانی ماسوولکەکانی زک ⇐ شکم‌بند

**زکون** / z(i)kûn/: ☜ **زگەڕۆ**

**زکونی** / z(i)kûnî/: ناو. *[پلار]* چەورەیی؛ چڵێسی ⇐ شکم‌پرستی

**زکەدڕێ** / z(i)ked(i)rê/: ناو. *[پلار]* لایەنگریی توند و تیژانە ⇐ طرفداری شدید

**زکەڕۆ** / z(i)keřo/: ☜ **زگەڕۆ**

**زکەسۆری** / z(i)kesorî/: ☜ **زکەشۆرە**

**زکەشۆرە** / z(i)keşore/: ناو. زکەسۆری؛ سکەشۆرە؛ زەحیر؛ بەلەفیرە ⇐ اسهال

**زکەماسێ** / z(i)kemasî/: ناو. ئیسقایی؛ نەخۆشی ئاوبەند ⇐ بیماری استسقا

**زکین** / z(i)kîn/: ☜ **زگەڕۆ**

**زکێشە** / z(i)kêşe/: ☜ **زکئێشە**

**زگ** / zig/: ناو. زک؛ سک: ١. لم؛ تل؛ شوولەم؛

ورگ؛ ئاشک؛ بەشێ لە لەشی گیانداری مۆرغەدار لە نێوان سنگ و ناوقەددا ٢. [مەجاز] کۆندامی هەرسەک ‹زگم باش کار ناکا› ٣. بەشی پاشووی لەشی مێروان ٤. بەشی زۆپ و دەرپەڕیوی هەر شتێ (وەک گۆزە و ...) ٥. جاری زاوزێ ‹حەوت زگی بووە› ٦. ناوسک؛ ناوەوە و دەروونی شتێ ▤ ١تا٦ شکم

⊡ **زگ پڕ کردن:** ئاوس کردن ▤ باردار کردن

**زگ پێ‌سوتان:** [مەجاز] زک پێ‌سووتان؛ زک پێ‌شەوتین؛ بەزە پێدا هاتن ▤ دل برای کسی سوختن

**زگ درین:** ☜ **زك درين**

**زگ شێلان:** [مەجاز] میوانی کەسێ بوون بۆ ماوەیەکی زۆر ▤ برای مدت زیادی مهمان کسی شدن

**زگ کار کردن:** ☜ **زك كار كردن**

**زگ وێستانەوە:** لە زکوزا کەوتن ▤ یائسە شدن

**زگ هەستان:** سک ماسین؛ با کردن ‹زگم وا هەستابوو خەریک بوو بتەقێم!› ▤ باد کردن شکم

**چونە زگ شتێکەوە:** سەر بردنە ناو هەموو وردەکاری و نهێنی شتێکەوە ▤ دل و رودەی چیزی را کاویدن

**لە زگ چوون:** لە کاتی منداڵ بوون مردن ▤ سر زا رفتن

**زگ‌ئێشە** / zig'êşe/: ناو. سکێشە؛ ناڤ‌ئێش ▤ شکم درد

**زگار**[1] / z(i)gar/: ناو. ١. زبارە؛ هەرەوەز ٢. ورکەبەرد ▤ ١. کار گروهی ٢. سنگریزه

**زگار**[2]: ئاوەڵناو. کز و کەنەفت و دڵ‌بەخەم ‹ئەو کەسەی هێندە نەبوو زویر و زگار/ وا نەکەوتە بەر چەپۆکی ڕۆژگار «هێمن»› ▤ زبون

**زگاری** / z(i)garî/: ناو. داماوی؛ زەبوونی ‹زاری و زگاری و زویری کەردم/ وە بارگەی پاکت پەنا ئاوەردم «مەولەوی»› ▤ زبونی

**زگانە** / z(i)gane/: ناو. ژینی بە نانەزگ ▤ زندگی بخور و نمیر

**زگبەرەڵا** / z(i)gbereła/: ئاوەڵناو. [مەجاز] زگەڕۆ؛ زۆرخۆر ▤ شکمو

**زگ‌پەرس** / zigperis/: ئاوەڵناو. [پلار] چڵێس؛ نەوسن ▤ شکم‌پرست

**زگچو** / zigçû/: ئاوەڵناو. ڤزۆک؛ زگڕەوان ▤ اسهال

**زگدار** / zigdar/: ئاوەڵناو. سکدار؛ دووگیان ▤ آبستن

**زگدڕاو** / zigd(i)řaw/: ☜ **زگەڕۆ**

**زگدەرپەڕیو** / zigderpeřîw/: ئاوەڵناو. [پلار] کرشە؛ سکزل ▤ شکم‌گُنده

**زگڕەوان** / zigřewan/: ئاوەڵناو. ڤزۆک؛ زگچوو ▤ اسهال

**زگڕەوانی** / zigřewanî/: ناو. سەرپایی؛ زگەشۆرە؛ بەلەفیرە ▤ اسهال

**زگزل** / zigzil/: ئاوەڵناو. زکزل؛ سکزل؛ خاوەن زگی گەپ و قەبە و دەرپەڕیو ▤ شکم‌گنده

**زگسوتاو** / zigsûtaw/: ئاوەڵناو. جەرگ‌سووتاو؛ کۆست‌کەوتوو ‹منی هەژاری زگ‌سووتاو/ چۆن پاش تۆ بژیم؟ شۆڕەلاو! «هێمن»› ▤ فرزندمُرده

**زگکەر** / zigker/: ئاوەڵناو. بزۆک. دژی نەزۆک ▤ زاینده

**زگلەوەڕێن** / zigleweřên/: ☜ **زكلەوەڕين**

**زگلەوەڕێنی** / zigleweřênî/: ناو. نفت؛ چلێسی ▤ شکم‌پرستی

**زگماک**[1] / zigmak/: ئاوەڵناو. زکماک؛ زکمانگ؛ زگماکی؛ زگماهی؛ پێوەندیدار یا سەر بە کاتی لە دایک بوون ‹کوێری زگماک› ▤ مادرزاد

**زگماک**[2]: ئاوەڵکار. زکماک؛ زکمانگ؛ زگماکی؛ زگماهی؛ بەو جۆرە لە دایک بووە ‹ئەتۆ هەر

زگماک وەها جوانی/ «تەوالێت» چییە؟ نـاوی نـازانی «هێمن»» ≡ مادرزاد

**زگماکی / zigmakî/:** ☜ **زگماك**

**زگماهی / zigmahî/:** ☜ **زگماك**

**زگن / zigin/:** ☜ **زگەڕۆ**

**زگنی / zig(i)nî/:** ☜ **زگەڕۆیی**

**زگورد / z(i)gurd/:** ئاوەڵناو. زووگوورت؛ زوگورد: ١. ڕەبەن؛ سەڵت؛ بێ‌هاوسەر ٢. داماو؛ بێچارە ≡ ١. مُجرد ٢. بیچارە

**زگوردی / z(i)gurdî/:** ئاوەڵناو. زوگـورتی؛ سەڵـت؛ ڕەبەن؛ بێ‌ژن ≡ مُجرد

**زگوزا / zig û za/:** ☜ **زاوزو**

**زگوێستاو / zigwêstaw/:** ئاوەڵناو. قەبز؛ بەسراو ≡ یُبس

**زگەخشکێ / z(i)gexişkê/:** نـاو. کاری بە زکەوە خۆ خشاندن ≡ سینەخیز

**زگەڕۆ / z(i)geřo/:** ئاوەڵناو. *[پەلار]* سـکەڕۆ؛ زکـن؛ سـکن؛ زکـوون؛ زکـین؛ زگـن؛ تـرخن؛ زکـەڕۆ؛ زگـدڕاو؛ زکـدڕاو؛ زک‌تێـڕ؛ زک‌کـوور؛ زگهانـک؛ زگ‌هۆڕ؛ زۆرخۆر ≡ شکم‌پرست

**زگەڕۆیی / z(i)geřoyî/:** ناو. *[کینایە]* زگنی؛ سـکنی؛ زگێنی؛ زۆرخۆری ≡ شکم‌پرستی

**زگەشۆرە / z(i)geşore/:** نـاو. بەلەفیـرە؛ تەقەفیـرە؛ شوولین ≡ اسهال

**زگهانک / zighanik/:** ☜ **زگەڕۆ**

**زگهۆڕ / zighoř/:** ئاوەڵناو. ١. ☜ **زگـەڕۆ** ٢. ☜ **زك‌بەل**

**زگێنی / z(i)gênî/:** ☜ **زگەڕۆیی**

**زل[١] / zil/:** نـاو. ١. پووشکەی باریکی لاسـکی گیـا ٢. ئەستێرەی ڕۆژێ ٣. بەلۆکە؛ میتکەی مێوینـە ٤. زەل؛ قـامیش؛ چیتـک ≡ ١. سـاقەی لخـت و نازک گیاه ٢. ستارەی سحری ٣. چوچولە ۴. نی

**زل[٢]:** ئاوەڵناو. ١. گەورە؛ بە بارسـتایی، پانـایی یـان چەندیـەتی زۆرەوە‹سـەری زل؛ ماشـینی زل› ٢. پایەبەرز؛ بەدەسەلات ‹پیاوی زل› ≡ ١. بـزرگ ٢. بلندپایە

⊡ **زل بـوون:** گـەورە بـوون: ١. لـە پچـووکی دەرچوون ٢. پایە بەرەو ژوور چوون ٣. گەشـە سەندن ≡ ١. بـزرگ شـدن ٢. بلندپایـە شـدن ٣. رشد کردن

⊡ **خۆ بە زل زانین:** لووتبەرز بـوون؛ بەدەعیـە و دەمار بوون ≡ تکبُر داشتن

**زل -[٣]:** پێشوشە. ١. ساغ؛ سـاق ‹زلکـوێر› ٢. مـەزن ‹زلـهێز› ≡ ١. سالم ٢. اَبَر-

**- زل[٤]:** پاشەوشـە. گەورە؛ هەراو ‹سـەرزل؛ قـنزل› ≡ گُندە

**زلاقوونک / z(i)laqûnik/:** ☜ **زەلەقوون**

**زلام / z(i)lam/:** ☜ **زەلام**

**زلان / z(i)lan/:** ناو. ١. ☜ **زریان** ٢. گێژەڵـووکە ≡ ١. ☜ **زریان** ٢. گردباد

**زلبری / zilb(i)rî/:** ئاوەڵـکار. زلپاتـە؛ پیچـەک؛ تۆزوولکە؛ کەمووسکە؛ بڕووکە ≡ کمترین مقدار

**زل‌بەقنگە / zilbeqinge/:** ☜ **زەلەقوون**

**زلبەقوونە / zilbeqûne/:** ☜ **زەلەقوون**

**زل‌بێ‌هونـەر / zilbêhuner/:** ئاوەڵـناو. *[پـەلار]* زەبەلاحی هیچ لێ‌نەهاتوو ≡ گُندەی بی‌خاصیت

**زلپاتە / zilpate/:** ☜ **زلبری**

**زلپک / zilpik/:** ناو. زپک؛ زیرکە ≡ جوش صورت

**زلحـورت / zilĥurt/:** ئاوەڵـناو. *[پـەلار]* دەگەنـەک؛ زەبەلاح ≡ لندهور

**زلحۆ / zilĥo/:** ☜ **زلحۆل**

**زلحۆرت / zilĥort/:** ☜ **زلحۆل**

**زلحۆل / zilĥol/:** ئاوەڵـناو. *[پەلار]* زلحـۆ؛ زلحـۆرت؛ زەپ‌زەپە؛ حەیتە؛ تەژەی گێل و حۆل ≡ لنـدهور خُل‌مزاج

**زل‌حیز / zilĥîz/:** ئاوەڵـناو. *[پەلار]* زل بـێ هونـەر؛

زەلامی بێزراو و بێغیرەت 🇮🇷 گُندەی بیجُربُزە

**زل ـ زل**[1] / zil zil/: ئاوەڵناو./پلار/ گەورە ـ گەورە ‹تیکەی زل ـ زلی ئەگرت و ئەینیا دەمی!› 🇮🇷 گُندە ـ گُندە

**زل ـ زل**[2]: ئاوەڵکار./پلار/ بێ شەرم و شووورەیی ‹کابرای دز، زل ـ زل دەهات و دەچوو!› 🇮🇷 راست ـ راست

**زلف** / zil(i)f/: ☜ **زوڵف**

**زلفۆ** / zilfo/: ئاوەڵناو. بە سەر و پرچ و کاکۆڵ 🇮🇷 موی سر و کاکل دراز

**زلق** / zilq/: ئاوەڵناو. بزۆز؛ هاروهاج 🇮🇷 بازیگوش؛ ناآرام

**زلقتی** / zilq(i)tî/: ناو. ١. مۆزە زەرد ٢. ☜ زڕقتی 🇮🇷 ١. از انواع مگس کە نیش میزند ٢. ☜ زرقتی

**زلک** / zilk/: ئاوەڵناو./پلار/ زڕ و زەلام 🇮🇷 گُندەبَک

**زلکوێر** / zilk(i)wêr/: ناو. زلکوور؛ نابینایێ کە چاوی بە دیمەن ساغە 🇮🇷 کور بە ظاهر سالم

**زلکور** / zilkûr/: ☜ **زلکوێر**

**زلکە** / zilke/: ناو. ١. جۆرێ ترێ ٢. جۆرێ سڵق 🇮🇷 ١. نوعی انگور ٢. گیاهی از تیرەی چغندر

**زلکێنە** / zilkêne/: ناو. زەرگەتە 🇮🇷 زنبور

**زللک** / zillik/: ناو. ١. بەلۆکە؛ میتکە ٢. دەنکە شەمچە 🇮🇷 ١. چوچولە ٢. چوب کبریت

**زللە** / zille/: ناو. ١. زلە؛ زیلە؛ زیللە؛ شەپلاخە؛ چەپلاخە ٢. گاڵتەجاڕ 🇮🇷 ١. سیلی ٢. مسخرە

**زلمبۆ** / z(i)limbo/: ناو. گەزۆ؛ شیلەی دار مازوو کە وەک شەونم دەبارێ 🇮🇷 شیرەی درخت مازوج

**زلمزۆ** / zilm(i)zo/: ناو. گەزۆ؛ گەز 🇮🇷 گز قنادی

**زلواک** / zilwak/: ناو. لاولاو؛ لافلافۆک 🇮🇷 لبلاب؛ پیچک

**زلون** / z(i)lun/: ناو. گێژەڵووکە؛ گەردەلوول 🇮🇷 گردباد

**زلۆرە** / z(i)lore/: ☜ **زلور**

**زلۆق** / z(i)loq/: ئاوەڵناو. زەق؛ ماق؛ واق؛ مۆلەق ‹چاقی ڤێ زلۆق مان› 🇮🇷 خیره

**زلوبی** / z(i)lûbî/: ☜ **زروبی**

**زلوبیا** / z(i)lûbya/: ناو. شیرینییەکی تورتە لە ماستی ئاوچن و نشاستە، کە لە ڕۆندا سووری دەکەنەوە و دە شەربەتی خەستی دەگەوزێنن 🇮🇷 زولبیا

**زلوت** / z(i)lût/: ئاوەڵناو./پلار/ ١. ڕووتەڵەی باریک و بێنموود ٢. تاس؛ سەربێموو ٣. ڕووت و قووت 🇮🇷 ١. لاغر و حقیر ٢. تاس ٣. عُریان

**زلور** / z(i)lûr/: ناو. زلۆرە؛ پێشاخوڕ؛ قەسەڵی ناو ئاخوڕ؛ کای درشتی بەرماوی مالات 🇮🇷 پسماندەی کاە در آخور

**زلوڤیاگ** / z(i)lûvyag/: ناو. هەرا ـ هەرا؛ زەنا ـ زەنا 🇮🇷 سر و صدای زیاد

**زلوک** / z(i)lûk/: ناو. زلووکە: ١. چیلکەی کورتی باریک ٢. چوکلەشەمچە؛ دەنکە شەمچە 🇮🇷 ١. خلال؛ چوب کوتاە باریک ٢. چوب کبریت

**زلوکە** / z(i)lûke/: ☜ **زلوک**

**زلە**[1] / z(i)le/: ☜ **زللە ـ١**

**زلە**[2]: ئاوەڵناو. زل؛ تەژە ‹کابرایەکی زلە هاتە سەر ڕێم› 🇮🇷 گُندە

**زلەمو** / z(i)lemû/: ناو. مووی ڕەپ و درشتی بن چناکەی پیرەژنان 🇮🇷 موی چانەی پیرزنان

**زلهمین** / zilh(i)mîn/: چاوگ. زەرد هەڵگەڕان 🇮🇷 زرد و ضعیف شدن

**زلهێز**[1] / zilhêz/: ناو. چەند دەوڵەتی زۆر بەهێز، بەتایبەت ئەمریکا 🇮🇷 ابرقدرت

**زلهێز**[2]: ئاوەڵناو. ١. خاوەن هێز و دەسەڵاتی زۆر ٢. گەورە دەسەڵاتدار 🇮🇷 ١. قدرتمند ٢. ابرقدرت

**زلی** / z(i)lî/: ناو. ١. زەلامی ٢. گەورەیی ٣. پایەبەرزی 🇮🇷 ١. گُندگی ٢. بزرگی ٣. بلندپایگی

**زلیتاو** / z(i)lîtaw/: ناو. چلپاو و قوڕ و لیته 🇮🇷 گل و لای

**زلیقۆ** / z(i)lîqo/: ناو. دەمووکانە؛ جۆرێ چەسپە 🇮🇷 مویزک؛ نوعی چسب

**زلینه** / z(i)lîne/: ☜ زەمیلە

**زلێن** / z(i)lên/: ناو. زەناو؛ زەلکاو 🇮🇷 مُرداب

**زلێندک** / z(i)lêndik/: ناو. دوێرد 🇮🇷 قیچی

**زڵ** / ził/: ناو. تاڵەکە؛ مێورەی باریکی ڕەز 🇮🇷 شاخەی باریک تاک

**زڵچه** / ziłçe/: دەنگەناو. دەنگی شتی تەڕی نەرم کە پای لێ نێن یان بە دەست بیگوشن ‹کەوشەکەم هەر زلچەی دێ› 🇮🇷 صدای جسم تر نرم زیر فشار

**زڵچەزڵچ** / ziłçeziłç/: دەنگەناو. زلچەی لە دووی یەک 🇮🇷 صدای پیاپی جسم تر نرم زیر ضربه

**زڵخاو** / ziłxaw/: ناو. کالان؛ کالان؛ کاڤلان 🇮🇷 غلاف؛ نیام

**زڵزڵه** / ziłz(i)łe/: ناو. کێم و زووخی برین؛ چلکی زام 🇮🇷 ریم؛ چرک زخم

**زڵف** / ziłf/: ☜ زوڵف

**زڵفان** / ziłfan/: ☜ زوفا

**زڵفنج**[1] / ziłfinc/: ناو. گیایەکی تاڵ و ژاراوی کە تۆزەکەی دەرمانی گیانداری کرمێیە 🇮🇷 گیاهی ضد انگل دام

**زڵفنج**[2]: سارستە. قوزەڵقورت؛ جوێنێکە وەک سندان 🇮🇷 کوفتِ کاری

⊡ **زڵفنج کردن**: کردنە قوزەڵقورت؛ بە زەهری مار کردن 🇮🇷 کوفت کردن

**زڵفنچک** / ziłfinçik/: ناو. زلزلە؛ چلک و کێمی برین 🇮🇷 ریم؛ چرک زخم

**زڵق** / ziłq/: ناو. ١. سلق؛ گیایەکی گەڵاپانە، لە چۆنەر دەکا و گەڵاکەی بۆ چێشت دەبێ ٢. قوڕ و لیتەی خلیسک 🇮🇷 ١. سِلق؛ نوعی سبزی از تیرەی چغندر ٢. گل و لای لیز

**زڵقاو** / ziłqaw/: ناو. ١. چێشتی سلق ٢. قوڕ و لیتە؛ حەڕیا تراو 🇮🇷 ١. آش سِلق ٢. مَنجلاب

**زڵقەزڵق** / ziłqeziłq/: دەنگەناو. جلقەجلق؛ قوڵتەی نێو قوڕی شل و قوڕاو 🇮🇷 صدای پا در گل و لای شُل

**زڵگه** / ziłge/: ☜ زبڵ ـ١

**زڵم** / ziłm/: ☜ زوڵم

**زڵه** / z(i)łe/: ناو. زلهە؛ زەڵە؛ چەقە و هەرا؛ چەقەچەق 🇮🇷 همهمه و جنجال

**زڵەزڵ** / z(i)łeził/: ناو. زەڵەزەڵ؛ زلەی زۆر 🇮🇷 جنجال زیاد

**زڵەقنای** / z(i)łeqnay/: ☜ شڵەقاندن

**زڵەقەتنای** / z(i)łeqetnay/: ☜ شڵەقاندن

**زڵەقیاگ** / z(i)łeqyag/: ناوەڵناو. شڵەقیاگ؛ شلەقاو 🇮🇷 بەهم‌زده

**زڵهه** / ziłhe/: ☜ زڵه

**زم** / zim/: ناو. ساردی 🇮🇷 سردی

**زما** / z(i)ma/: ناو. سەرما 🇮🇷 سرما

**زماک** / z(i)mak/: ناو. زماگ؛ نزار؛ نسار؛ شوێنێ لە چیا کە تاوی کەمتری وێ کەوێ 🇮🇷 سایەسار

**زماکی** / z(i)makî/: ناو. زمانی دایکی؛ زوانی ماری؛ زوانی مایێ 🇮🇷 زبان مادری

**زماگ** / z(i)mag/: ☜ زماك

**زمان** / z(i)man/: ناو. زبان؛ زوان؛ زوفان؛ زوبان؛ زڤان؛ هەزمان؛ ئەزمان؛ زۆ؛ زمـوون: ١. زان؛ زوخان؛ ئەندامی گۆشتنی بزۆز دە زاری زۆربەی بربڕەداراندا کە لە ناسینەوەی چێژەی جۆراوجۆر، قووت دانی خۆراک و قسە کردن لە مرۆدا، دەوری هەیە ٢. زمانی ولسات کە بە کولاوی دەیخۆن ‹بابۆلەی زمانمان خوارد› ٣. *[مەجاز]* هێز یا توانای قسە کردن ‹مەگەر زمانت نییە بۆ قسە ناکەی؟› ٤. سیستەمێکی بڕیاری ڕێکوپێک لە

دەنگ یان نیشانەگەلی نووسین کە لە نێوان مرۆڤەکانی کۆمەڵگایەکدا بۆ دەربڕین و وەرگرتنی پەیام و هزر بە کار دێت ‹زمانی کوردی› ٥. کۆمەڵێک درۆشم و نیشانە کە لە بوار و بەستێنێکی تایبەت، دە نێوان گرۆیەکدا بە کار دەچێ ‹زمانی گیانەوەران؛ زمانی کەمپیوتەر› ٦. *[مەجاز]* زمانی بیانی؛ زمانی نامۆ ‹ئازاد زمان دەخوێنێ بچێ بۆ هەندەران› ٧. *[مەجاز]* زاراوە و شێوەی قسە کردن ‹زمانی خۆش؛ زمانی تاڵ› ٨. جۆرێ نان شیرینی وەکوو زمان ▬ ١تا٨ زبان

▪ **زمانی ئاماژە:** کاری ڕاگەیاندنی مەبەستی خۆ بە ئاماژە ▬ زبان اشاره

**زمانی ئەدەبی:** زمانی وێژەیی؛ وشە و زاراویەک کە لە نووسینی زمانێک بەتایبەت لە نووسراوەی ئەدەبیدا بە کار دەچێ ▬ زبان ادبی

**زمانی بێزمانی:** *[مەجاز]* کاری دەربڕین و تێگەیاندنی مەبەست بێ ئەوەی بە ڕاشکاوی قسەی لێوە بکرێ ▬ زبان بی‌زبانی

**زمانی پێوەر:** شێوە نووسین یان ئاخافتنێ کە پێوەری ڕادەی دروستی و نادروستی نووسین و قسە کردنی ئاخێوەرانی زمانێکە و لە کتێب و ڕۆژنامە و تەلەفزیۆن و ڕادیۆدا بەکار دەچێ ▬ زبان معیار

**زمانی تاڵ:** *[مەجاز]* زمانی شەڕ؛ زمانی ڕەش؛ دەمی پیس؛ قسەی ڕەق؛ قسەی تفت و تاڵ؛ قسەی شڕ و دڕ ▬ زبان تندوتیز

**زمانی تەڕ و پاراو:** *[مەجاز]* دەربڕینی ڕەوان و ڕێکوپێک ▬ زبان شیوا

**زمانی حاڵ:** *[کینایە]* ئەو شتەی کە چلۆنایەتی و بارودۆخی کەسێ یان شتێک دەردەبڕێ ▬ زبان حال

**زمانی خۆش:** *[مەجاز]* قسەی خۆش؛ زمانی شیرین؛ لفت و گفتی خۆش وێڕای دلۆڤانی ‹بە زمانی خۆش مار لە کون دێتە دەر «مەسەل»› ▬ زبان خوش

**زمانی ڕەش:** ☜ **زمانی تاڵ**

**زمانی دایکی:** ☜ **زمانی زکماک**

**زمانی زکماک:** زمانی دایکی؛ زوانی مایێ؛ زمانێ کە مرۆڤ لە منداڵییەوە لە ڕێگای ئاخافتنی دایک و بابەوە فێری دەبێ و بەو زمانە لەگەڵ هاووڵاتیانیدا قسە دەکا ▬ زبان مادری

**زمانی زێڕینگەران:** چزیمزی؛ زێ ـ زێ؛ شێوە ئاخافتنێکی تایبەت کە لە گۆڕانی ڕاوێژ و جێبەجێکرانی بڕگەگەلی زاراوە پێکدێ و پێشتر لە ناو ڕیزی زێڕینگەرانی تاراندا دروست بوو، بەم چەشنە کە نێوان هەر بڕگەیەک «ز»ییەک زیاد دەکەن ▬ زبان زرگری

**زمانی فەرمی:** زمانی ڕەسمی؛ زمانێ کە لە مەزرینگە و دام و دەزگا دەوڵەتییەکان و نووسراوەی سەر بە دەوڵەتی هەر وڵاتێکدا بە کار دەچێ ▬ زبان رسمی

**زمانی نێوگەلانی:** ☜ **زمانی نێونەتەوەیی**

**زمانی نێونەتەوەیی:** زمانی نێوگەلانی؛ زمانێ کە لە نێوان نەتەوەگەلی جۆراوجۆردا پەرەی سەندووە و بە زمانی یەکگرتووی جەهانی ناوبانگی دەرکردووە و بە کار دەچێ (وەک: فەرانسی لە ڕابردوودا و ئینگلیزی لە ئێستادا) ▬ زبان بین‌المللی

**زمانی وێژەیی:** ☜ **زمانی ئەدەبی**

▫ **زمان بە چاو نەگەیشتن:** *[مەجاز]* زۆر تینوو بوون ‹هێندە تینوومە، زمان بە چاوم ناگا› ▬ عطش زیاد داشتن

**زمان بەستن:** ١. دەم لێکنان؛ تاقەت هێنان و قسە نەکردن ٢. کەوتنە گیانەلا ‹حاڵی زۆر خراپە، زمانی بەستووە› ▬ ١. زبان به دهان گرفتن ٢. به حال نزع افتادن

**زمان بە لادا خستن:** کەتمان کردن؛ ڕاستی قسە نەگوتن ☚ کتمان کردن

**زمان بە مۆڵەق وێستان:** ☜ **زمان شکان**

**زمان شکان:** زمان بە مۆڵەق وێستان؛ زمان لە گۆ چوون؛ زمان لە جووڵە کەوتن؛ قسە پێ نەکران لە نەخۆشی، سەرمان یان لە تینگی ☚ زبان از حرکت افتادن

**زمان کێشان:** *[مەجاز]* تینوو بوونی وا کە مرۆ نەتوانێ هەناسە بدات ☚ زبان افتادن از تشنگی

**زمان گرتن:** ۱. لاڵەپەتە بوون ۲. شووفاری کردن ۳. زمان کرانەوە؛ فێرە قسە بوونی منداڵ ☚ ۱. الکن شدن ۲. جاسوسی کردن ۳. زبان باز کردن بچە

**زمان گەستن:** *[کینایە]* پەژیوان بوونەوە ☚ پشیمان شدن

**زمان گیران:** *[کینایە]* قسە بۆ نەهاتن ☚ زبان بند آمدن

**زمان لە گۆ چوون:** ☜ **زمان شکان**

**زمان لە زار/ دەمی کەسێکدا نەبوون:** *[کینایی]* ۱. بێدەم و زمان بوون؛ زۆر بەستەزمان و بەشخوراو بوون ‹ئەو فەقیرە زمان لە زاریدا نییە چۆن کاری وای لێ دێ؟› ۲. بێدەنگ بوون و قسە نەکردن لە کاتی پێویستدا ‹باشە، زمان لە زارتدا نەبوو جوابێکی بدەیتەوە؟› ☚ ۱. بسیار محجوب و مظلوم بودن ۲. زبان کسی را موش خوردن

**زمان لێ دان:** ۱. *[مەجاز]* فوو پێدا کردن؛ تاریف کردنی بە درۆ ۲. خاپاندن و هانە دان ☚ ۱. مدح دروغین کردن ۲. فریب دادن و تحریک کردن

**زمانی کەسێک کول بوون:** *[مەجاز]* زمانی کەسێک موو دەرهێنان؛ بۆ ڕازی کردنی کەسێک زۆر قسە کردن ‹زمانم کول بوو تا ڕازیم کرد نەچێ›

☚ زبان کسی مو درآوردن

**زمانی کەسێک مو دەرهێنان:** ☜ **زمانی کەسێك کول بون**

**بە هیچ زمانێ حاڵی نەبون:** *[مەجاز]* مل نەدان بە قسەی ژیرانە و ڕەوا ☚ زبان آدم سر کسی نشدن

**سەر(ی) زمان گرتن:** *[مەجاز]* تور بوون؛ بە ڕەوانی قسە نەکردن ☚ زبان گرفتن

**لە زمانی کەسێ حاڵی بون:** *[کینایی]* تێگەیشتن لە کەسێک ☚ زبان کسی را فهمیدن

**لە زمانی کەسێکەوە گوتن:** *[کینایی]* وتەیەک لە لایەن کەسێکەوە دەربڕین ☚ از زبان کسی گفتن

**هاتنە زمان:** *[مەجاز]* هاتنە قسە ☚ سخن آغاز کردن

**هێنانە زمان:** *[مەجاز]* وە قسە هێنان؛ قسە لێ دەرهێنان ☚ بە حرف آوردن

**زمانباز** / z(i)manbaz/: ☜ **زمانتەڕ**

**زمانبەد** / z(i)manbed/: ☜ **زمانپیس**

**زمانپاراو** / z(i)manparaw/: ناوەڵناو. *[کینایی]* زوانپاراو؛ دەماوەر؛ دەمپاراو؛ قسەزان. هەروەها: **زمانپاراوی** ☚ سُخندان

**زمانپاک** / z(i)manpak/: ناوەڵناو. *[کینایی]* بەئەدەب ☚ مؤدب

**زمانپسک** / z(i)manpisk/: ناوەڵناو. قسەزمان؛ قسە ☚ الکن

**زمانپیس** / z(i)manpîs/: ناوەڵناو. *[کینایی]* زمانبەد؛ جنێوفرۆش ☚ بدزبان

**زمانتاڵ** / z(i)mantał/: ناوەڵناو. *[مەجاز]* دەمتاڵ ☚ بددهن

**زمانتەڕ** / z(i)manteř/: ناوەڵناو. *[کینایی]* زمانباز؛ زمانلووس؛ زوانلووس؛ زوانچەور؛ دەمتەڕ؛ دیلباز؛ دیلبان؛ لێهاتوو لە دەربڕینی قسەی جوان و دڵخواز بۆ بە دەست هێنانی دڵی دیتران بە

مەبەستی گەیشتن بە مرازی خۆ ☰ چرب‌زبان

**زمانتەڕی** / z(i)manteřî/: ناو. *[کینایە]* قەڵوەدەل؛ زمانلووسی ☰ چرب‌زبانی

**زمانخۆش** / z(i)manxoş/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* خۆش‌زوان؛ قسەخۆش؛ شیرین‌زمان ☰ شیرین‌زبان

**زماندار** / z(i)mandar/: ئاوەڵناو. *[کینایی]* ١. ☜ زماندرێژ ٢. ڕەوان‌بێژ؛ دەمڕاست ☰ ١. ☜ زماندرێژ ٢. فصیح

**زماندرێژ** / z(i)mand(i)rêj/: ئاوەڵناو. *[پلار]* زماندار؛ چەقەسرۆ؛ چەنەباز ☰ زبان‌دراز

**زماندرێژی** / z(i)mand(i)rêjî/: ناو. *[کینایە]* چەنەچەن؛ هەڵەوەڕی ☰ زبان‌درازی

**زماندن** / z(i)mandin/: چاوگ. بەرەڵا/ وێڵ کردن ☰ رها کردن

**زمانڕەش** / z(i)manřeş/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دەم‌پیس؛ جنێوفرۆش ☰ بددهن

**زمانڕەق** / z(i)manřeq/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* قسەڕەق؛ قسەتاڵ ☰ رُک گو

**زمانزان** / z(i)manzan/: ناو. زوان‌زان؛ کەسێ کە یەک یان چەند زبانی بیانی دەزانێ ☰ زباندان

**زمانسووتێن** / z(i)mansûtên/: ئاوەڵناو. گەزنەدە؛ گەزننە؛ تیژ ☰ تُندمزه

**زمانشڕ** / z(i)manşiř/: ئاوەڵناو. *[پلار]* زاردڕاو؛ زاربەڵاو؛ زارشڕ؛ دەمدڕاو؛ زوان‌شڕ؛ دەمشڕ؛ تێدانەوەستاو ☰ دهن‌لق

**زمانشیرن** / z(i)manşîrin/: ☜ زمانشیرین

**زمانشیرین** / z(i)manşîrîn/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* زمانشیرن؛ قسەخۆش ☰ شیرین‌سخن

**زمانگا** / z(i)manga/: ناو. زوانەگا؛ زمانەگا؛ زوانی؛ گۆزروان؛ گاوزبان؛ گیایەکی ئالیکی یەک ساڵانە، بە گەڵای تاکی زبر و کوڵکن و گوڵی ئاوی و سپییەوە ☰ گل گاوزبان

**زمانگر**[١] / z(i)mangir/: ناو. *[مەجاز]* زمانگیر؛ زوانگر؛ زوانگیر؛ شووفار؛ جاسووس ☰ جاسوس

**زمانگر**[٢]: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* زمانگیر؛ زوانگر؛ زوانگیر؛ زمان‌گران؛ تور؛ لاڵەپەتە ☰ الکن

**زمانگران** / z(i)mang(i)ran/: ☜ زمانگر[٢]

**زمانگەز** / z(i)mangez/: ئاوەڵناو. توون؛ تیژ لە چێژەدا ☰ تُندمزه

**زمانگیر** / z(i)mangîr/: ☜ زمانگر

**زمانلوس** / z(i)manlûs/: ☜ زمانتەڕ

**زمانلووسی** / z(i)manlûsî/: ناو. *[پلار]* جامەلووسکێ؛ مەرایی ☰ چرب‌زبانی

**زمانناس** / z(i)mannas/: ☜ زمانەوان

**زمانۆک** / z(i)manok/: ناو. ١. زمانەچکۆلە؛ ئەلەنگە ٢. زمانەی زەنگۆڵە ٣. نیتکەی بن چلەناسکەی گەڵا و سەر لاسکی گیا ☰ ١. زبان کوچک ٢. زبانەی زنگولە ٣. زبانک

**زمانە** / z(i)mane/: ناو. زوانە: ١. قیتکەی باریکی وەک زمان لە ناو شتێکدا ٢. گڕی ئاگر ☰ ١. زبانە ٢. زبانەی آتش

**زمانەبەرخ** / z(i)maneberx/: ناو. ڕکێشە؛ ڕەکێشە ☰ بارهنگ

**زمانەچکۆلە** / z(i)maneç(i)kole/: ناو. زمانۆک؛ ئەلەنگە ☰ زبان کوچک

**زمانەچکۆڵە** / z(i)maneç(i)kołe/: ناو. ئەلەنگە؛ زمانۆک ☰ لهات؛ زبان کوچک

**زمانەچوێلەکە** / z(i)maneç(i)wêleke/: ناو. گیایەکە بۆ ئاش و دۆخەوا باشە ☰ گیاهی خوراکی

**زمانەخەسوو** / z(i)manexesû/: ناو. زوانەخەسوو؛ گیایەکی گەڵاپان و دڕکاویی ناوچەی وشکە، لە گوڵداندا پەروەردە دەکرێ ☰ کاکتوس

**زمانەگا** / z(i)manega/: ☜ زمانگا

**زمانەوان** / z(i)manewan/: ناو. زمان‌ناس؛ زبان‌ناس؛ زوان‌ناس؛ کەسێ کە لە سەر بنەمای

زمـان و چییـەتی، پێکهاتـە و گۆڕانکارییـەکانی دەکۆڵێتەوە ☰ زبان‌شناس

**زمانـەوانی** / z(i)manewanî/: نـاو. زبـان‌ناسـی؛ زوان‌ناسی؛ زانستی لێکدانەوەی پەیڤی مرۆڤ، کە یەکەگـەل، چییـەتی، پێکهاتـە و گـۆڕانی زمـان دەگرێتەوە ☰ زبان‌شناسی

**زمانی** / z(i)manî/: ☜ **زارەکی**

**زمانی** / z(i)manî/: ئاوەڵناو. زوانی: ١. پێوەندیـدار بە زبانەوە ٢. دەمـی؛ زارەکـی؛ بـە دەم وتـراو ٣. *[مەجاز]* سـەرزارەکی؛ سـەرزاری؛ بـەبێ هـاوڕێیی لەگەڵ کرداردا ‹دۆستی زمانی› ☰ ١تا٣. زبانی

**زمانیـار** / z(i)manyar/: نـاو. فێرکـاری زمـان بـۆ ئەوانەی لە قسە کردندا کەم و کووڕییـان هەیـە. هەروەها: **زمانیاری** ☰ زبانیار

**زمای** / z(i)may/: چاوگ. ئەزمین ☰ آزمودن

**زمایش** / z(i)mayiş/: چاوگ. زاریان ☰ زاریدن

**زمبـە** / zimbe/: نـاو. زمـە؛ شیشـی تفـەنگ پـاک کردنەوە ☰ سُنبەی تفنگ

**زمبەر** / zimber/: ☜ **زەممە**

**زمبێل** / zimbêl/: ☜ **سمێڵ**

**زمبێـــلبۆق** / zimbêlboq/: ئاوەڵـــناو. *[پـــلار]* سوێڵ‌قەوی؛ سمێڵ‌زل ☰ سبیل‌کلفت

**زمبێلقەیتـان** / zimbêlqeytan/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* ١. خـاوەن سمێڵـی ڕەش و بریقـەدار ٢. خـاوەن سمێڵی باریک ☰ ١. دارای سـبیل سـیاە و بـراق ٢. دارای سبیل باریک

**زمبێلن** / zimbêlin/: ☜ **سمێڵی**

**زمبێلی** / zimbêlî/: ☜ **سمێڵی**

**زمپارە** / zimpare/: ناو. سمپارە؛ کاغەز پـەرداخ ☰ کاغذ سُنبادە

**زمپـەرە** / zimpere/: نـاو. سماتـە؛ بەردەسماتـە ☰ سُنبادە

**زمرووت** / zimrût/: ☜ **زمڕووت**

**زمرووتی** / zimrûtî/: ☜ **زمڕووتی**

**زمڕاندن** / zimřandin/: چـاوگ. تاقی کردنـەوە ☰ امتحان کردن

**زمڕاو** / zimřaw/: ئاوەڵناو. ئەزموون‌کراو ☰ امتحان پس‌دادە

**زمـڕق** / zimřiq/: نـاو. چـزوو؛ چـز (دووپشـک و زەرگەتە و ...) ☰ نیش (عقرب و زنبور و...)

**زمڕوت** / zimřut/: ☜ **زمڕووت**

**زمڕووت** / zimřût/: نـاو. زمڕوت؛ زامروت؛ زامڕووت؛ زمـرووت؛ زامـرووت؛ زوبـەرد؛ جـۆرێ بـەردی بەنرخی کەسک بە برێ ئوکسید کرۆمەوە کە لـە گەوهەرسازیدا بەکار دەچێ ☰ زُمُرد

**زمڕووتی** / zimřûtî/: ئاوەڵناو. زامڕووتی؛ زامڕووتین؛ زمرووتی؛ چێکراو لە زمڕووت ☰ زُمُردین

**زمسان** / zimsan/: ☜ **زستان**

**زمسانە** / zimsane/: ☜ **زستانی**

**زمسانی** / zimsanî/: ☜ **زستانی**

**زمستان** / zimistan/: ☜ **زستان**

**زمستانی** / zimistanî/: ☜ **زستانی**

**زمستانین** / zimistanîn/: ئاوەڵـناو. زستانی؛ شیاوی زستان ☰ زمستانی

**زمستون** / zimistun/: ☜ **زستان**

**زمستو** / zimistû/: ☜ **زستان**

**زمسو** / zimsû/: ☜ **زستان**

**زملیق** / zimlîq/: پێرۆ. ← **زەردوزملیق**

**زمنای** / zimnay/: ☜ **زمین-١**

**زمۆنگـە** / z(i)monge/: نـاو. تاقیگـە؛ شـوێنی ئەزموون ☰ آزمایشگاە

**زمـوودە** / z(i)mûde/: ئاوەڵناو. ئەزموو؛ تاقی‌کراوە ☰ آزمودە شدە

**زموون** / z(i)mûn/: ☜ **زمین-١**

**زمـە**[١] / z(i)me/: نـاو. ١. شـیش و پـەتی خـاوێن کردنـەوەی لوولەتفـەنگ ٢. ئاسـنی بـاریکی بـە

پێچی نووک‌تیژه‌وه بۆ کون کردنی دار ☰ ۱. سُنبه ۲. متّه

▪ **زمه**[۲]: پاشه‌وشه. ئه‌زمێنه‌ر ‹مێرده‌زمه› ☰ ـ آزما

**زمه‌گولیلک / z(i)megulîlik/**: ناو. زوقم؛ سیخوار؛ خوێز ☰ سرماریزه؛ پژ

**زمهار / zimhař/**: ☜ **زمهه‌ڕ**

**زمهه‌ریر / zimherîr/**: ناو. *[کینایه]* زه‌مهه‌ریر: ۱. سه‌رما و سۆڵه؛ سه‌رمای تووش ۲. زۆزان؛ جێگای زۆر سارد ☰ ۱و۲. زمهریر

**زمهه‌ڕ / zimheř/**: ناو. زمهار؛ زمێر؛ ئاردی ئازووقه‌ی زستان ‹ئه‌وی گه‌نمی ڕه‌نێو دێنا به زه‌حمه‌ت/ له ماڵیدا نه‌بوو خۆی زمهه‌ڕێک جۆ «هێمن»› ☰ آرد آذوقه‌ی زمستان

**زمی / z(i)mî/**: لێل. ← **زمی‌وناڵه**

**زمیلی / z(i)mîlî/**: ☜ **سمێڵ**

**زمین / z(i)mîn/**: چاوگ. ۱. زمنای؛ زموون؛ تاقی کردنه‌وه ۲. گریان و ناڵاندن ☰ ۱. آزمودن ۲. زاریدن

**زمی‌وناڵه / z(i)mî w nałe/**: چاوگ. گریان و ڕۆڕۆ ☰ گریه و زاری

**زمیهتن / z(i)mîhtin/**: چاوگ. ۱. گاڵه و ناڵه کردن ۲. ده‌نگ دانه‌وه‌ی زۆر که‌س پێکه‌وه ☰ ۱. زاریدن ۲. انعکاس صدای جمعیت

**زمێ / z(i)mê/**: ☜ **سمێڵ**

**زمێر / z(i)mêr/**: ☜ **زمهه‌ڕ**

**زمێل / z(i)mêl/**: ☜ **سمێڵ**

**زمێلی / z(i)mêlî/**: ☜ **سمێڵی**

**ـ زن / -zin/**: پاشگر. ۱. ـ ده‌ڵێن؛ ده‌رده‌ر ‹ته‌ڕه‌زن› ۲. ـ ده‌ر ‹درۆزن› ☰ ۱. ـ ده؛ ـ زا؛ ـ خیز ۲. ـ زن

**زنار / z(i)nar/**: ناو. زنگار: ۱. به‌ردی زۆر گه‌وره ۲. شاخ؛ تیشه؛ به‌ردی ڕژد و بڵند ☰ ۱. سنگ بزرگ ۲. صخره

**زنا ▪ زنا / z(i)na z(i)na/**: ☜ **زه‌نا ـ زه‌نا**

**زناک / z(i)nak/**: ناو. ۱. تابلۆی هات‌وچۆی سه‌ر ڕێ ۲. نیشانه‌کانی خاڵبه‌ندی (وه‌ک: . ؛ ؟ ، ! و ...) ☰ ۱. تابلوی راهنمایی و رانندگی ۲. علائم نقطه‌گذاری

**زنالۆ / z(i)nalo/**: ☜ **خاڵۆزن**

**زنانی / z(i)nanî/**: ☜ **زینگانی**

**زناو / z(i)naw/**: ناو. زه‌مینێ که هه‌میشه ته‌ڕ و شله و ئاو ده‌داته‌وه ☰ تکاب

**زنتۆل / zintol/**: ناوه‌ڵناو. زه‌لامی قه‌ڵه‌و؛ ته‌ژه‌ی ئه‌ستوور ☰ تنومند

**زنتووت / zintût/**: ناو. تیز؛ وشه‌ی گاڵته پێ‌کردن ☰ کلمه‌ی مسخره کردن

**زنج**[۱] **/ zinc/**: ناو. ۱. چارداغی له قامیش ‹تۆ قه‌سری سێ قات بۆ بکه‌ی به ماڵ/ من نه‌مبێ زنجێ بۆ خۆم و مناڵ! «قانع»› ۲. حه‌وشی له چه‌په‌ر و قامیش بۆ ماڵات تێ‌کردن ۳. ☜ **زه‌نی** ٤. دوو په‌ڕه‌ی جه‌غزئاسای زه‌ردی پان و په‌ل که ئامرازی مووسیقان و پێکیاندا ده‌ده‌ن ۵. کوته‌ک ☰ ۱. آلاچیق ۲. حیاط مانندی از ترکه و نی برای نگهداری دام ۳. ☜ **زه‌نی** ۴. سِنج؛ از آلات موسیقی ۵. چُماق

**زنج**[۲]: ناوه‌ڵناو. تیژ؛ تێژ ☰ تیز

**زنجار / zincar/**: ناو. ژه‌نگار؛ ژه‌نگی مس، که ماکێکی که‌سکی شینباوه و زۆر ژاراوییه و زۆرتر به هۆی هاوته‌نشتی ئه‌سید یان دارِزانه‌وه به‌دی دێ ☰ زنگار؛ زنگ مس

**زنجاف / zincaf/**: ناو. په‌راوێزی عابا و که‌وا ☰ سجاف

**زنجک / zincik/**: ناو. جووته؛ لووشکه ☰ لگد

**زنجه‌ڵه / zinceĺe/**: ناو. ئامرازێکی که‌وانی بۆ ماڵوو که ده‌گه‌ڵ ماڵووکێش لێک‌بدرێ ☰ از وسایل کشاورزی برای صاف کردن کشتزار

**زنجی** / zincî/: ناو. ١. لووت؛ کەپۆ؛ کەپ ٢. پەل؛ پاژێک لە گۆشت ☰ ١. دماغ ٢. تکە گوشت

**زنجیر** / zincîr/: ناو. زنجیلە؛ زەنجیر: ١. ئاڵقەڕیز؛ زریزە؛ زریێ؛ گەڵوازەیەکی کانزایی پێکەوە لکاو بۆ بەستن، هەڵواسین و گۆزانەوەی هێزی میکانیکی یان (بە جۆرێکی‌تر) بۆ خشڵ و زەمبەر بە کار دێ ٢. چەن ڕیسە ئاڵقەی ناسکی پێکەوە بەسراو کە بۆ تازیە لە خۆیانی دەدەن ☰ ١و٢. زنجیر

◘ **زنجیر کردن:** *[کینایە]* گرتن؛ قۆڵبەست کردن ☰ دستگیر کردن

**زنجیرپسێن** / zincîrp(i)sên/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* خاوەن توانست و لێهاتوویی زۆر و خۆڕاگر لە هەمبەر کۆسپ و گوشارەوە ‹منی زنجیرپسێن لێرە ئەسیری بسکی جوانێکم/ زەمانە گەرچی ئاڵۆز و پەشێوە، کەڵ بە موو بەندە «هێمن»› ☰ بسیار مقاوم و نستوه

**زنجیردار** / zincîrdar/: ئاوەڵناو. بەزنجیر ‹مەنجەڵی زنجیردار› ☰ دارای زنجیر

**زنجیرلەمە** / zincîrleme/: ئاوەڵکار. بەزنجیرە؛ یەک بە شوێن یەک ☰ زنجیروار؛ یکی بعد از دیگری

**زنجیرە** / zincîre/: ناو. ١. بە ڕیز و و یەک بە تەنیشت یەکەوە ‹زنجیرە کێو› ٢. زبری و لەلەی کەناری پارەی لە سکەدراو ‹ئەم لیرەیە سواوە زنجیرەی نەماوە› ٣. پەیوەستەیی؛ گەواڵە؛ گەڵوازە؛ ڕەوتی یەک لە دوای یەک بوون ☰ ١. رشتە؛ سلسلە ٢. دندانەی دور مسکوکات ٣. تسلسل

◘ **زنجیرەی بژێوی** پلیکانەی گیاندارانی دەڤەرێکی سروشتی کە هەر تیرەیەک (لە گیا و گیانەوەر) تیرەیەکی‌تر دەخوا و بەم شێوە، ژیانییان بەردەوام دەبێ ☰ زنجیرەی غذایی

◘ **زنجیرە دان:** بە تەنیشت یەکەوە ڕیز بوون ☰ بە صف شدن

**زنجیرەکێو** / zincîrekêw/: ناو. ڕزد؛ گاز؛ ڕزدە ☰ رشتەکوە

**زنجیرەیی** / zincîreyî/: ئاوەڵناو. بە بیچم یان دۆخی زنجیرەوە، بەتایبەت بە یەک لە شوێن یەکی و بەردەوامی یان پێوەندییەوە ☰ زنجیرەای

**زنجیلە** / zincîle/: ☜ **زنجیر**

**زنچک** / zinçik/: ناو. زینچک: ١. تەڕایی کەم ٢. زیچک؛ کێم و زووخی برین ☰ ١. تراوش نم ٢. چرک زخم

**زنچکاو** / zinç(i)kaw/: ناو. زینچکاو؛ زیچکاو؛ زەرداوی برین ☰ زردابەی زخم

**زنخ** / zinx/: ئاوەڵناو. گەنیو؛ گەنی ☰ گندیدە

**زندان** / zindan/: ☜ **زیندان**

**زندق** / zindiq/: ئاوەڵناو. ١. دووڕوو؛ ڕووبین ٢. خوانەناس ☰ ١. مُنافق ٢. خدا ناباور

**زندۆڵ** / zindol/: ☜ **ئاواندۆڵ**

**زندوو**[1] / zindû/: ناو. *[مەجاز]* کێچ و سپێ ‹زندووم دە لەشدایە› ☰ کک و شپش

**زندوو**[2]: ☜ **زیندوو**[2]

**زندەومردە** / zindewmirde/: ناو. قووڵکەی بە پووش و پەڵاش داپۆشراو بۆ خۆ تێدا شاردنەوە ☰ چالەی سرپوشیدە با خس و خاشاک

**زندی** / zindî/: ئاوەڵناو. زیندی؛ زیندوو: ١. زینگ؛ خاوەن ژیان ٢. ڕاستەوخۆ ☰ ١. زندە ٢. مُستقیم

**زندیق** / zindîq/: ئاوەڵناو. مانەوی؛ شوێنکەوتووی یەکێ لە ئایینە ئێرانییەکان، بەتایبەت ئایینی مانی ☰ زندیق

**زنژ** / zinj/: ناو. لووت؛ کەپۆ ☰ بینی

**زنگ** / zing/: دەنگەناو. دەنگی زەنگۆڵە ☰ صدای زنگولە

**زنگ** / zinig/: ئاوەڵناو. زینگ؛ زیندوو ☰ زندە

**زنگار** / zingar/: ناو. ١. ژەنگ ٢. ☜ **زنار** ☰ ١. زنگار ٢. ☜ **زنار**

**زنگازنگ** / zingazing/: دەنگەناو. دەنگەدەنگی زەنگۆڵە ☰ بانگ جرس

**زنگایش** / zingayiş/: ☜ **زرینگانەوە**

**زنگرین** / zing(i)rîn/: چاوگ. *[پەلار]* تۆپین؛ کەوتین ☰ سقط شدن

**زنگزاوا** / zingzawa/: ناو. گاینە؛ ولیرە؛ گادانە؛ گاودانە ☰ گاودانە

**زنگل** / zingil/: ☜ **زەنگۆڵە ـ١**

**زنگلزاوا** / zingilzawa/: ناو. کزن؛ جۆرە دەغڵێکە گای پێ قەڵەو دەبێ ☰ گاودانە

**زنگلک** / zing(i)lik/: ناو. زەنگۆڵەی پچووک ☰ زنگولەی کوچک

**زنگلی** / zing(i)lî/: ناو. جۆرێ کولووچە ☰ نوعی کلوچە

**زنگەچاڵ** / zingeçał/: ☜ **زیندەبەگۆڕ**

**زنگەزنگ** / zingezing/: دەنگەناو. دەنگی زەنگی زۆر بە دووی یەکدا ☰ صدای پیاپی زنگولە

**زنگی** / zingî/: دەنگەناو. ١. تەقەی دنان؛ دەنگی وێک‌کەوتنی ددان لە سەرمان یا ترس ٢. دەنگی وەکوو زەنگۆڵە کە بە دەم و زمان لاسایی دەکرێتەوە ☰ ١. صدای بە هم خوردن دندان‌ها ٢. صدای شبیە صدای زنگولە

**زنگین**[1] / zingîn/: ☜ **زرینگانەوە**

**زنگین**[2]: دەنگەناو. دەنگی زەنگۆڵە ☰ صدای جَرَس

**زننو** / zinnû/: ☜ **زیندوو**[2]

**زننە** / zinne/: ☜ **زیندوو**[2]

**زنوێر** / zinwêr/: ناو. زنێر؛ شاخی سەخت ‹سوێسن و بەیبوون و شللێر/ ڕواون لە جێگای زنوێر «هێمن»› ☰ کوە صخرەای

**زنە**[1] / z(i)ne/: ناو. زەن: ١. زوهۆڕ؛ لەرزک؛ زناو؛ زەوینێ کە هەمیشە تەڕە و ئاو دەدەڵێنێ ٢. کانیلە؛ ئاودزە ‹دایکی زانایە کوڕی ئازا دەنێرێتە خەبات/ من گوتم تۆش تێ‌بگە! ناگاتە دەریایە، زنە «هێمن»› ☰ ١. زمین آبزا ٢. چشمەی کوچک

**زنە**[2]: ☜ **زیندوو**[2]

**زنەکێش** / z(i)nekêş/: ناو. ١. گاسنێ کە قووڵ دەکێڵێ ٢. زۆنگ‌کێش؛ جۆگەڵەی دەسکردی نێو زۆنگ بۆ ئاو دەرکردنی ☰ ١. گاوآهنی کە عمیق شخم می‌زند ٢. جوی دست‌ساز در زمین آبزا

**زنەکێشی** / z(i)nekêşî/: ناو. کار و ڕەوتی هەڵکێشانی ئاو لە دەشتێکدا ☰ زهکشی

**زنەگی** / z(i)negî/: ☜ **زیندەگی**

**زنەی** / z(i)ney/: ناو. ژیان؛ ژین ☰ زندگی

**زنەیی** / z(i)neyî/: ☜ **زیندەگی**

**زنی** / z(i)nî/: ☜ **زیندوو**[2]

**زنینەوە** / z(i)nînewe/: چاوگ. *[مەجاز]* ژیانەوە؛ هەستانەوەی دوای مردن ☰ زندە شدن پس از مرگ

**زنییەی** / zinyey/: چاوگ. ١. دەرهێنان ٢. دەرکردن ٣. دانە دەرەوە ☰ ١. بیرون آوردن ٢. بیرون کردن ٣. بیرون زدن

**زنێر** / z(i)nêr/: ناو. ١. ☜ **زەردەماسی** ٢. تووکە سەری لێک‌هاڵاوی چڵکن ٣. ☜ **زنوێر** ☰ ١. ☜ **زەردەماسی** ٢. موی ژولیدەی کثیف ٣. ☜ **زنوێر**

**زوا** / z(i)wa/: ناوەڵناو. ١. وشک؛ ئیشک ٢. ڕەق؛ توند ☰ ١. خُشک ٢. سفت

**زوار** / z(i)war/: ناوەڵناو. هەژار؛ بێچارە ☰ بینوا

**زواڵە** / z(i)wałe/: ناو. ١. زوێل؛ زۆل؛ زۆڵە؛ زۆلاک؛ زۆلەک؛ پارچەیەکی بڕاو لە چەرم ٢. گزمووڵە قوڕ ☰ ١. برشی از چرم ٢. کلوخە

**زوان** / z(i)wan/: ناو. ١. ☜ **زمان** ٢. زریزان؛ زیوان؛ دەنکێ ڕەشە لە ناو گەنم پەیدا دەبێ ☰ ١. ☜ **زمان** ٢. دانەی سیاە بوجاری گندم

▣ **زوانی ماری**: ☜ **زماکی**

**زوانی ماین**: ☜ **زماکی**

**زوان‌به‌گیر** / z(i)wanbegîr/: ئاوه‌ڵناو. تر؛ تور ☰ الکن

**زوان‌پاراو** / z(i)wanparaw/: ☜ **زمان‌پاراو**

**زوان‌چه‌ور** / z(i)wançewr/: ☜ **زمان‌ته‌ڕ**

**زوان‌زان** / z(i)wanzan/: ☜ **زمان‌زان**

**زوان‌شڕ** / z(i)wanşiř/: ☜ **زمان‌شڕ**

**زوانگ** / z(i)wang/: ☜ **زوهانگ**

**زوانگر** / z(i)wangir/: ☜ **زمانگر**

**زوانگیر** / z(i)wangîr/: ☜ **زمانگر**

**زوان‌لووس** / z(i)wanlûs/: ☜ **زمان‌ته‌ڕ**

**زوان‌مه‌لیچک** / z(i)wanmelîçik/: ناو. زوانه‌مه‌لیچک؛ زوانه‌مه‌لووچکه؛ داری بناو ☰ درخت زبان گنجشک

**زوان‌ناس** / z(i)wannas/: ☜ **زمانه‌وان**

**زوان‌ناسی** / z(i)wannasî/: ☜ **زمانه‌وانی**

**زوانه** / z(i)wane/: ☜ **زمانه**

**زوانه‌بووکه** / z(i)wanebûke/: ناو. گوڵه‌ئاڵوز؛ گیایه‌که له تیره‌ی هه‌لالان، به هێشووی پێچه‌ڵپێچی درێژ و بنه‌وش، سوور یان سپی ☰ زبان‌درقفا

**زوانه‌خه‌سوو** / z(i)wanexesû/: ☜ **زمانه‌خه‌سوو**

**زوانه‌گا** / z(i)wanega/: ☜ **زمانگا**

**زوانه‌مه‌لووچکه** / z(i)wanemelûçke/: ☜ **زوان‌مه‌لیچك**

**زوانه‌مه‌لیچک** / z(i)wanemelîçik/: ☜ **زوان‌مه‌لیچك**

**زوانی** / z(i)wanî/: ☜ **زمانگا**

**زوبان** / zuban/: ☜ **زمان**

**زوبزوو** / zubzû/: ئاوه‌ڵکار. یه‌ک‌به‌یه‌ک ☰ یک‌به‌یک

**زوبون** / zubun/: ناو. جۆرێ قوماشه ☰ نوعی پارچه

**زوبه‌رد** / zuberd/: ☜ **زمرووت**

**زوتا** / zuta/: ئامراز. ١. له به‌ر ئه‌وه؛ بۆیه ٢. به بۆنه‌ی؛ به هۆی ☰ ١. از آن جهت ٢. به خاطرِ

**زوتک** / zutik/: ☜ **زۆتك**

**زوجاجیه** / zucaciye/: ناو. تراوێکی ڕوون و لینجه زۆربه‌ی گۆی چاو له پشته‌وه‌ی گلێنه پڕ ده‌کاته‌وه ☰ زُجاجیه

**زوچ** / zuç/: ☜ **زت**[1]

**زوحاک** / zuĥak/: ☜ **زوهاك**

**زوخ** / zux/: ناو. زوقم؛ ئاڵشک ☰ سرماریزه

▣ **زوخ بردن:** سه‌رما بردن ☰ سرما زدن

**زوخاڵ** / zuxał/: ناو. ١. ☜ **خه‌ڵووز** ٢. تێلا؛ دارده‌ستی ئه‌ستوور ☰ ١. ☜ **خه‌ڵوز** ٢. چُماق

**زوخاڵدان** / zuxałdan/: ☜ **خه‌ڵووزدان**

**زوخان** / zuxan/: ☜ **زمان ـ١**

**زوخبرده** / zuxbirde/: ئاوه‌ڵناو. سه‌رمابرده ☰ سرمازده

**زوخرمه** / zuxirme/: ☜ **زوقولمه**

**زوخرۆک** / zuxrok/: ☜ **زوخره**

**زوخرۆنک** / zuxronik/: ☜ **زوخرۆنه‌ك**

**زوخرۆنه‌ک** / zuxronek/: ناو. زۆخرۆنک؛ زیخه‌لان؛ خیزه‌لان ☰ شنزار

**زوخره** / zuxre/: ناو. زوخرۆک؛ زوخوڕ؛ وردکه‌به‌رد ☰ شن

**زوخم** / zux(i)m/: ناو. ١. ☜ **زوقم ـ١** ٢. ڕیش ده‌رمان؛ بنی گیایه‌کی تالی بۆنخۆشه ☰ ١. ☜ **زوقم‌ـ١** ٢. زنجبیل بیابانی

**زوخمه** / zuxme/: ☜ **سوخمه‌ـ١**

**زوخوڕ** / zuxuř/: ☜ **زوخره**

**زورار** / zurar/: ناو. براژن؛ ژنی برا ☰ زن‌برادر

**زوربه** / zurbe/: ☜ **زۆربه**

▣ **زوربه ساندن/ سه‌ندن:** ١. زۆر هێنان ٢. په‌ره سه‌ندن ☰ ١. فشار آوردن ٢. فراگیر شدن

**زوربه‌ت** / zurbet/: ناو. کاری به زۆر ناچار کردن ☰ اجبار

**زورده** / zurde/: ناو. فەریکی دەخڵ و دانەوێڵە ☰ دلمل؛ نیمرس غله و حبوبات

**زورقوتک** / zurqutik/: ناو. زوڵقوتک؛ چزووی هەنگ ☰ نیش زنبور عسل

**زورک** / zurk/: ناو. جافری؛ جۆرێ سەوزی ☰ جعفری؛ از سبزی‌ها

**زورکان** / zurkan/: ☜ **زوران ـ١**

**زورکاندن** / zurkandin/: چاوگ. زووقاندن؛ دەنگ دەرهاتنی هێسر ☰ درآمدن صدای قاطر

**زورکە** / zurke/: دەنگەناو. زووقە؛ دەنگی هێسر ☰ صدای قاطر

**زورگە** / zurge/: ☜ **زوران ـ١**

**زورم** / zur(i)m/: ناو. گورم؛ گرمە؛ دەنگی هەور ☰ تُندر؛ صدای رعد

**زورن** / zur(i)n/: ناو. زوورک؛ زەوی ڕەقی بەرداوی ☰ زمین سخت و سنگلاخی

**زورهان** / zurhan/: ناوەڵناو. *[پەلار]* زۆرهان؛ پیر؛ بەساڵاچوو ‹پیری زورهانی کەنەفتی دەربەدەر/ دیدەسووری دڵ مەکۆی دەرد و کەسەر «هێمن»›. هەروەها: **زورهانی** ☰ سالخورده

**زوڕات** / zuřat/: ناو. زوڕەت؛ زەڕات: ١. زوڕاتە کێویلە؛ هەرزنە گەورە ٢. گەنمەشامی ☰ ١. ارزن خوشه‌ای ٢. بلال؛ ذرت

**زوڕاتەکێویلە** / zuřatekêwîle/: ☜ **زوڕات ـ١**

**زوڕزوڕ** / zuřzuř/: ناو. گوڕگوڕ؛ گریانی بە دەنگی بەرز ☰ شیون و زاری

**زوڕنا** / zuřna/: ☜ **سڕنا**

**زوڕناتک** / zuřnatik/: ناو. سڕناتک؛ سوڕناتک؛ گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ ☰ گیاهی دارویی

**زوڕناچی** / zuřnaçî/: ☜ **سڕناژەن**

**زوڕناژەن** / zuřnajen/: ☜ **سڕناژەن**

**زوڕناژەنە** / zuřnajene/: ناو. شێلاقە؛ شەلاقە؛ مەلێکی کۆچەرە ☰ آبچلیک

**زوڕەت** / zuřet/: ☜ **زوڕات**

**زوشک** / zuşk/: ناو. دووپشک؛ دومارەکۆڵ ☰ عقرب

**زوغم** / zuğm/: ☜ **زوقم ـ١**

**زوفان** / zufan/: ☜ **زمان**

**زوفت** / zuft/: ناوەڵناو. ١. پڕاوپڕ؛ دارماڵ ٢. *[کینایە]* چرووک؛ ڕەزیل؛ ڕژد؛ چکووس؛ دەس‌قووچاو؛ پیسکە ٣. ☜ **زبر** ☰ ١. مالامال ٢. خسیس ٣. ☜ **زبر**

**زوڤر**[1] / zuvr/: ناو. بنچە؛ ڕەگەز ☰ اصل و نسب

**زوڤر**[2]: ☜ **زبر**

**زوڤری** / zuvrî/: ناو. زرووی؛ زبری ☰ زبری

**زوقرە** / zuqre/: ناو. ↓

◘ **زوقرە کردن**: دیق کردن؛ لە داخا مردن ‹لە سوێی قومە ومەنەوزێکدا زوقرەیان کرد/ لە تاسەی ڕامووسینێکدا هەڵپڕووکان «قادر عەلیخا»› ☰ دق کردن

**زوقم** / zuq(i)m/: ناو. ١. زوخم؛ زوغم؛ زق؛ زقوم؛ زۆقم؛ زەق؛ زمەگولیلک؛ سیخوار؛ خویز؛ ئاڵشت؛ دۆخ یان ڕەوتی بەستنی شەونم لە کاتی سارد بوونی کەشدا ٢. زەهر؛ زار؛ ژەهر ☰ ١. پژ؛ سرماریزه ٢. سَم؛ زهره

◘ **زوقم بردن**: سەرما بردن؛ هەڵکرچان و خراو بوون بە زوقم ☰ تلف شدن بر اثر سرماریزه

**زوقورتمە** / zuqurt(i)me/: ☜ **زوقولمە**

**زوقولمە** / zuqulme/: ناو. زوقورتمە؛ زوخرمە؛ سوخرمە ☰ سُقُلمه

**زوک** / zuk/: ☜ **زەق**[2]

**زوکام** / zukam/: ناو. ئارسم؛ ئاسرم؛ هەڵامەت ☰ زُکام

**زوکولە** / zukule/: ناو. بەلبەلەزوانە؛ زمانە چکۆلە ☰ زبان کوچک

**زوگورتی** / zugurtî/: ☜ **زگوردی**

**زوگورد** / zugurd/: ☜ **زگورد**

**زولاک** / zulak/: ناو. باریکە؛ شەلیت؛ تیزمالک ☰ باریکە؛ نوار

**زولف** / zulf/: ☜ **زولف**

**زولقوتک** / zulqutik/: ☜ **زورقوتك**

**زوڵاڵ** / zułał/: ئاوەڵناو. زەلاڵ: ۱. ڕەوان (دەنگ و ئاواز) ۲. ڕوون (تراو بەتایبەت ئاو) ☰ ۱. صاف (صدا) ۲. زلال

**زوڵف** / zuł(i)f/: ناو. زلف؛ زووف؛ زلف؛ زولف؛ کەزی؛ ئەگریجە؛ بسک ‹ژنیان وتووە بە زولفەوە، گۆزەیان وتووە بە قولفەوە «مەسەل»› ☰ زلف

**زوڵفشەمسە** / zuł(i)fşemse/: ناو. شەش گولینگی شەدە کە لە پێشەوەی (سێ بەم لا و سێ بەو لادا) شۆڕ دەکەنەوە ☰ منگولەای کە زنان بە دستار آویزان می‌کنند

**زوڵم** / zułim/: ناو. زالمەتی؛ زالمکی؛ زالمێنی؛ زالمایەتی؛ زڵم؛ ستەم؛ ناهەقی. هەروەها: **زوڵم کردن؛ زوڵم لێ چوون؛ زوڵم لێ کران؛ زوڵم لێ کردن** ☰ ظُلم

**زوڵملێکراو** / zułmlêk(i)raw/: ئاوەڵناو. مافخوراو ☰ مظلوم

**زوم** / zum/: ناو. ۱. ☜ **زۆم** ۲. چەوری؛ چەورایی ☰ ۱. ☜ **زۆم** ۲. چربی

**زوما** / zuma/: ☜ **زاوا**

**زومدار** / zumdar/: ئاوەڵناو. چەور ☰ چرب

**زومران** / zumran/: چاوگ. تاقی کرانەوە ☰ امتحان شدن

**زومراندن** / zumrandin/: چاوگ. تاقی کردنەوە ☰ آزمودن

**زونا** / zuna/: ناو. ۱. زۆنا؛ نەخۆشییەکی ڤایرووسییە، لقێکی دەمار تووش دەکا و دەبێتە هۆی دەرکەوتنی زیپکە و بلۆق لە سەر پێست و ئێش و خوروویەکی زۆر ۲. گیایەکی گوڵ شینە ☰ ۱. زُنا ۲. گیاهی با گل کبود

**زونکەن** / zunken/: ناو. پەروەندان؛ ناوی بازرگانی کەرەستەیێک وەک بەرگێکی گەورە و ئەستوور کە بەڵگە و نووسراوەی تێ دەنێن و بۆ بەرگری لە بلاوە بوونیان، لێوارەکانیان کون دەکەن و بە میلەیانەوە دەکەن و بە فەنەر دەیانبەستن ☰ زُنکن

**زونگ** / zung/: ناو. باسترمە؛ پاسترمە؛ گۆشتی قیمەکراوی دە ناو ڕیخۆڵە ئاخندراو ☰ سوسیس

**زوە** / z(i)we/: ناو. ۱. زا؛ زادە ۲. ☜ **زیپکە-۱** ☰ ۱. اولاد ۲. ☜ **زیپکە-۱**

**زوها** / zuha/: ئاوەڵناو. زوا: ۱. وشک ۲. ڕەق؛ سەخت ☰ ۱. خشک ۲. سخت و سفت

**زوهاک** / zuhak/: ئاوەڵناو. زوحاک؛ وریا و زرنگ ☰ زبر و زرنگ

**زوهانگ** / zuhang/: ناو. زوانگ؛ مەرەکەفمژ ☰ کاغذ خشک‌کن

**زوهم** / zuhm/: ناو. ڕۆنی بەز؛ چەورایی بەز ☰ چربی پیه

**زوهۆڕ** / zuhoř/: ☜ **زنە[۱]-۱**

**زوهۆم** / zuhom/: ناو. چەوری؛ چەورایی ☰ چربی

**زوهووم** / zuhûm/: ناو. ۱. چەوری؛ چەورایی ۲. پێخۆر ☰ ۱. چربی ۲. نانخورش

**زویر** / z(i)wîr/: ئاوەڵناو. زڤیر؛ زوویر: ۱. زوور؛ ناقایل ۲. خەمین و مات ‹گەر پرسی لە من بۆچی وەها زار و زویری/ نایزانی چ دەردیکە کورم دەردی فەقیری «موفتی پێنجوێنی»› ۳. تووڕە ‹گەر نەچم لێم زویر دەبێ، وەقتێ دەچم مەنعم دەکا/ سەیری کە بێ‌مرووەتە چیم لێ دەکا و چیم پێ دەکا «حاجی قادر»› * هەروەها: **زویر بوون؛ زویر کردن** ☰ ۱. ناراضی ۲. غمگین ۳. خشمگین

**زویری** / z(i)wîrî/: ناو. زوێری؛ زوویری؛ خەم و تووڕەیی ☰ عصبانیت

**زویـر** / z(i)wêr/: ئاوەڵـناو. ۱. زوور؛ ناقایـل ۲. خوێن‌شیرین ۳. کـز و خـەمین ☰ ۱. ناراضـی ۲. سبک‌روح ۳. غمگین

**زویری** / z(i)wêrî/: ☜ **زویری**

**زوێل** / z(i)wêl/: ☜ **زبڵ ـ۱**

**زوێڵ**[1] / z(i)wêł/: ☜ **زواڵە ـ۱**

**زوێڵ**[2]: ☜ **زۆڵ**[2]

**زوێڵەچەرم** / z(i)wêłeçerm/: نـاو. سـەختیان ☰ بُرشی از چرم

**زوێن** / z(i)wên/: ئاوەڵناو. ۱. کز و لاواز؛ لەجەر ۲. خەمبار و پەرێشان ☰ ۱. لاغرمُردنی ۲. زار

**زۆ** / zo/: نـاو. ۱. گیایەکی بۆنخۆشە ۲. قوولـکەی چاو؛ زەقایی چاو ۳. یەک؛ ژمارەی سـەرەتایی ☰ ۱. گیاهی خوشبو ۲. کاسەی چشم ۳. یک

⊡ **زۆ بوون**: چاو زەق بوون؛ چاو دەرپەڕیو بوون ☰ برجستە بودن چشم

**زۆبا** / zoba/: ☜ **سۆپا**

**زۆباڵمە** / zobalme/: ناو. وردە ساچمەی تفـەنگی ڕاو ☰ ساچمەی ریز تفنگ شکاری

**زۆپ**[1] / zop/: نـاو. ۱. داردەسـتی ئەسـتوور ۲. *[مەجاز]* ئەنـدامی زاوزێ نێـر ۳. گاشـەبەرد ☰ ۱. چُماق ۲. آلت مرد ۳. خرسنگ

⊡ **زۆپ ئەستوون**: *[کینایە]* دەسـەڵاتداری زاڵـم ☰ فرمانروای ستمگر

**زۆپ**[2]: ئاوەڵـناو. ۱. قیـت؛ زەق؛ زاق؛ دەرپـەڕیو ۲. ئەستوور و ڕەق ☰ ۱. برجستە ۲. ستبر و سخت

**زۆپا** / zopa/: نـاو. ۱. داردەسـتی ئەسـتوور ۲. کوورەی ئاگر ☰ ۱. چُماق ۲. بُخاری

**زۆپایی** / zopayî/: ☜ **زۆپی**

**زۆپک** / zopik/: نـاو. پـەیاغ؛ تـێلا؛ داردەسـتی ئەستوور ☰ چُماق

**زۆپۆ** / zopo/: ئاوەڵناو. *[پلار]* زل‌بێ‌هونەر؛ زەلامـی تەنبەڵ و تەوەزەل ☰ گُندەی بیکارە

**زۆپە**[1] / zope/: نـاو. ۱. زۆپـا؛ سـۆپا؛ کـوورە ۲. کوتەکی سەر زل ۳. مزراح؛ مزرەق ☰ ۱. بُخاری ۲. گُرز؛ چُماق ۳. گردنا

**زۆپە**[2]: ئاوەڵکار. بە دەستی زۆر ☰ قهراً

**زۆپی** / zopî/: نـاو. زۆپـایی؛ قـیتی؛ گـتـایی ☰ برجستگی

**زۆپ.زۆپ** / zop zop/: ناو. چاوشارەکێ؛ خۆشارکێ؛ قەرا ـ قەرا ☰ قایم‌موشک

**زۆتا** / zota/: نـاو. گیایەکە لە ڕێحان دەکا و گوڵی شینە ☰ گیاهی شبیه ریحان با گل بنفش

**زۆتک** / zotik/: ناو. زوتک؛ لێواری کونی قنـگ ☰ دیوارەی مقعد

**زۆتی** / zotî/: ناو. نفرە؛ تووک؛ دوعـای نـەباش ☰ نفرین

**زۆخ**[1] / zox/: ناو. زووخ: ۱. توانایی؛ هێز ۲. خـوێن و کێمی تێکەڵ ☰ ۱. یارا ۲. مخلوط چرک و خون

**زۆخ**[2]: ئاوەڵناو. زووخ؛ توانا و بەکار ☰ توانا

**زۆخاو** / zoxaw/: ناو. زاخاو؛ کـاری مشـت و مـاڵ دانی تیخ ☰ صیقل تیغ

**زۆخی** / zoxî/: نـاو. وەستای شیرگەر؛ کەسێ تـیخ زاخاو دەداتەوە ☰ صیقل‌گر

**زۆر**[1] / zor/: نـاو. زوور: ۱. هێـز؛ هـازی؛ وزە؛ ستووری؛ ستین؛ زەبر؛ دەگەرە؛ گـوژم؛ قـەوەت؛ قەوە ‹کوردە زۆر جار بـووە کـەم زۆری وە سـەر زۆر بکەوێ/ قەت مەڵـێ دوژمـنی مـە زۆرە بـەڵام ئێمـە کەمین «ئاوات»› ۲. ناحـەقی؛ زوڵـم ‹لـەو وڵاتـەدا زوڵم و زۆر حاکمـە› ۳. فشـار؛ گوشـار ‹زۆری بـۆم هێنا› ٤. ڕوەکێکە لە ئاودا شین دەبێ و لە پیـزڵ دەکا ☰ ۱. زور ۲. ظلم ۳. فشار ۴. گیاهی است

⊡ **زۆر بردن**: زۆر بـرن؛ زۆر پـێ‌شـکان/ شـکان؛ دەرەقەت هاتن ☰ زور چربیدن

**زۆر برن**: ☜ **زۆر بردن**

**زۆر بۆ هاتن**: کەوتنە تەنگانەوە ☰ زیر فشار واقع

شدن

**زۆر بۆ هێنان:** گوشار خستنە سەر کەسێ/ شتێ ‹زۆر بێنن بۆ گەماڵ، وەک تانجی دەرئەچێ! «مەسەل»› ■ فشار آوردن

**زۆر پێ شکان/ شکیان:** ☜ **زۆر بردن**

**زۆر کردن:** ☜ **زۆر لێ‌کردن**

**زۆر لێ کردن:** زۆرکردن؛ زۆر لێ کرن: ١. هێز دان ‹هەرچی زۆرم لێ کرد، درگاکە نەکراوە› ٢. تەقالا دان بۆ ڕازی کردن ‹زۆرم لێ کرد بگەڕێتەوە› ٣. ناچار کردن ‹کاکە زۆری لێ مەکە با بە کەیفی خۆی بێ› ■ ١و٢. زور زدن ٣. واداشتن به کاری

**زۆر لێ کرن:** ☜ **زۆر لێ کردن**

**زۆر لێ هاتن:** لە بەر گران بوون؛ پێ سەخت بوون ‹زۆرم لێ دەهات، دەست لەم و لەو ڕابکێشم› ■ زور داشتن

**زۆر هێنان:** زۆر و زەحف بوونی شتێ ‹گەرما زۆری هێناوە؛ ئاو زۆری هێنا و پردەکەی شکاند› ■ زیاد شدن شدت/ فشار چیزی

**زۆر**[٢]: ئاوەڵناو. زوور؛ گەلێک؛ فریە؛ فرە؛ بۆش ‹کوردە زۆر جار بووە کەم زۆری وە سەر زۆر بکەوێ/ قەت مەڵێ دوژمنی مە زۆرە بەلام ئێمە کەمین «ئاوات»› ■ زیاد؛ بسیار

⊡ **زۆر بوون:** فرە بوونەوە؛ زیاد کردن ■ زیاد شدن

**زۆر کردن:** خستنە سەر؛ فرە کردن ■ افزودن

**زۆر**[٣]: ئاوەڵکار. زوور؛ فرە ‹زۆر جوانە؛ زۆر قسە دەکا› ■ بسیار

**زۆر**[٤]: پێشوشە. پڕ ـ؛ فرە ‹زۆربڵێ› ■ پُر ـ

▪ **زۆر**[٥]: پاشوشە. قەوەت؛ هێز ‹کەمزۆر› ■ ـ زور

**زۆرئاخن / zor'axin:** ئاوەڵناو. زۆرتەپێن؛ بە زۆر ئاخنراو لە شوێنێکدا ■ زورچپان

**زۆراتی**[١] / zoratî: ناو. زۆرینە؛ بەشی هەرەزۆر لە شتێ ■ اکثریت

**زۆراتی**[٢]: ئاوەڵکار. بەزۆری؛ بە زەبری هێز ■ زورکی

**زۆران / zoran:** ناو. زۆرانی؛ زۆرەبان؛ زۆرەبانی؛ زۆرەبانێ؛ زۆرەوان؛ زۆرەوانی؛ زۆروو؛ وەرزشێکی دوو کەسییە، هەر کەس ئەوی‌تر بە زەویدا بدا دەیباتەوە ■ کُشتی

**زۆرانباز / zoranbaz:** ناو. زۆرەبانباز؛ زۆرانگر؛ زۆرانی‌گر؛ زۆرەوانی‌گر؛ کەسێ کە کاری زۆران گرتنە ■ کُشتی‌گیر

**زۆرانبازی / zoranbazî:** ناو. زۆرەبانبازی؛ ململانێ؛ کاری زۆرەبانێ گرتن ■ کُشتی

**زۆرانگر / zorangir:** ☜ **زۆرانباز**

**زۆرانی / zoranî:** ☜ **زۆران**

**زۆرانیک / zoranîk:** ناو. ١. سەهۆڵخانە؛ بەفرەچاڵ ٢. بەرپرسی بەفرەچاڵ ■ ١. یخچال ٢. مسئول یخچال

**زۆرانی‌گر / zoranîgir:** ☜ **زۆرانباز**

**زۆربگیر / zorb(i)gîr:** ☜ **ڕەشبگیر**

**زۆربڵە / zorb(i)łe:** ☜ **زۆربڵێ**

**زۆربڵێ / zorb(i)łê:** ئاوەڵناو. *[پلار]* زۆربڵە؛ زۆربێژ؛ زۆروەڕ؛ زۆرویژ؛ چەنەباز؛ فرەویژ ■ پُرحرف

**زۆربڵێیی / zorb(i)łêyî:** ناو. چەنەبازی؛ چەنەچەن ■ وراجی

**زۆربە**[١] / zorbe: ناو. زوربە: ١. زۆراتی ٢. زاڵی ■ ١. اکثریت ٢. چیرگی

**زۆربە**[٢]: ئاوەڵکار. زوربە: ١. زۆر؛ فرە ٢. زۆرینە ■ ١. بسیار ٢. اکثریت

**زۆربەی / zorbey:** ئامراز. پڕایی؛ زۆرینەی ■ اکثرِ

**زۆربێژ / zorbêj:** ☜ **زۆربڵێ**

**زۆربێژی / zorbêjî:** ناو. کەڵەگایی ■ زورگویی

**زۆرتەپێن / zortepên:** ئاوەڵناو. زۆرەخن؛ بە زۆر ئاخنراو لە شوێنێکدا ■ زورچپان

⊡ **زۆرتەپێن کردن:** بە زۆر ئاخنین ‹ئاوا کتێبەکان

زۆرتەپێن کراون، بەرگەکانیان خراپ دەبێ› 🇮🇷 زورچپان کردن

**زۆرخاخ** / zorxax/: ناو. ١. دۆڵی ئاشی ٢. جۆگەی ئاش گێڕان 🇮🇷 ١. درّەی جای آسیاب ٢. ناودانی آسیاب

**زۆرخانە** / zorxane/: ناو. ١. باشگای وەرزشی کۆنی ئێرانی، بریتی لە دالانێکی سەرگیراو و گۆڕەپانێکی جەغزۆکە و چاڵ کە وەرزشی کەونارای تێدا دەکرێ ٢. [پلار] دەساو؛ ئاودەست 🇮🇷 ١. زورخانه ٢. توالت

**زۆرخایەن** / zorxayen/: ☜ **زۆرخایێن**

**زۆرخایێن** / zorxayên/: ئاوەڵناو. زۆرخایەن؛ درێژخایەن 🇮🇷 زمانبَر

**زۆرخواز** / zorx(i)waz/: ناو. فرەویست؛ زێدەخواز 🇮🇷 زیادەخواه

**زۆرخۆر** / zorxor/: ئاوەڵناو. خۆرا؛ فرەخۆر. هەروەها: **زۆرخۆری** 🇮🇷 پُرخور

**زۆردار** / zordar/: ئاوەڵناو. ١. بە توانا؛ بەقەوەت ٢. دەسەلاتداری زاڵم ‹کووپە و کەنووتان پڕ گەنم و جۆ بێ/ دەبا زۆردارتان هەر ڕەنجەڕۆ بێ «فولکلۆر»› ٣. لە گەشە؛ هەراش (گوڵ و گیا) 🇮🇷 ١. پُرزور ٢. ستمگر ٣. بانشاط و بالنده (گُل و گیاه)

**زۆرداری** / zordarî/: ناو. ناهەقی؛ زلم؛ شێوەی بە کار هێنانی زۆر و تەوژم بۆ ترساندن یان ملکەچ کردنی خەڵک و گوێڕایەڵ کردنیان ‹منیش زۆرداری پرزەی لێ بریوم/ منیش بەدکاری بواری لێ تەنیوم «هێمن»› 🇮🇷 ستمکاری؛ زورمداری

**زۆرزان** / zorzan/: ئاوەڵناو. فرەزان: ١. دانا؛ زانا ٢. [پلار] سەگ؛ فێڵباز 🇮🇷 ١. دانا ٢. ناتو

**زۆرفرۆش** / zorf(i)roş/: ئاوەڵناو. بازاڕخۆش؛ سەوداخۆش 🇮🇷 خوش‌معامله

**زۆرک** / zorik/: ناو. زۆرکان؛ ڕەپن؛ زەوینی سفت و ڕەق 🇮🇷 زمین سفت

**زۆرکان** / zorkan/: ☜ **زۆرک**

**زۆرگر** / zorgir/: ئاوەڵناو. زۆرتر پێ بڕاو 🇮🇷 دارای سهم بیشتر

**زۆرلەوەڕ** / zorleweř/: ئاوەڵناو. بەدەم؛ بەلەزخۆر 🇮🇷 تُندخور

**زۆرلێکراو** / zorlêk(i)raw/: ئاوەڵناو. ١. ناچارکراو ٢. زوڵملێکراو؛ مافخوراو 🇮🇷 ١. مجبور شده ٢. مظلوم

**زۆرم** / zorim/: ناو. زۆرمە؛ بەشی زۆر؛ زۆربە 🇮🇷 اکثر

**زۆرملی** / zorm(i)lî/: **زۆرەملێ**

**زۆرمە** / zorme/: ☜ **زۆرم**

**زۆروزەبەند** / zor û zebend/: ئاوەڵناو. زۆروزەوەند؛ زۆر؛ فرە؛ زیاد ‹ماڵی زۆروزەبەندت لە خوێنی خەڵکە› 🇮🇷 بسیار

**زۆروزەوەند** / zor û zewend/: ☜ **زۆروزەبەند**

**زۆروەڕ** / zorweř/: ☜ **زۆربڵێ**

**زۆروێژ** / zorwêj/: ☜ **زۆربڵێ**

**زۆروێژی** / zorwêjî/: ناو. درێژدادڕی؛ چەنەبازی 🇮🇷 پُرگویی؛ رودەدرازی

**زۆرو** / zorû/: ☜ **زۆران**

**زۆرەبان** / zoreban/: ☜ **زۆران**

**زۆرەبانباز** / zorebanbaz/: ☜ **زۆرانباز**

**زۆرەبانبازی** / zorebanbazî/: ☜ **زۆرانبازی**

**زۆرەبانی** / zorebanî/: ☜ **زۆران**

**زۆرەبانێ** / zorebanê/: ☜ **زۆران**

**زۆرەخن** / zorexin/: ئاوەڵناو. زۆرتەپێن؛ پاڵەپەستۆ 🇮🇷 زورچپان

**زۆرەزمێ** / zorez(i)mê/: ناو. کاری تاقی کردنەوەی هێز و توان 🇮🇷 زورآزمایی

**زۆرەکی**[1] / zorekî/: ئاوەڵناو. زۆری؛ زۆراتی؛ بە خورتی؛ کەرەزەڕی ‹پێکەنینی زۆرەکی› 🇮🇷 زورکی

**زۆرەکی**[2]: ئاوەڵکار. بە زۆر؛ زۆراتی؛ زۆرەملێ؛

نەوەدڵی؛ بە زەبری هێز ‹زۆرەکی لـێم ساند› ◙ زورکی

**زۆرەملی** / zorem(i)lî/: ☜ **زۆرەملێ**

**زۆرەملێ**[1] / zorem(i)lê/: ناو. زۆرملی؛ زۆرەملی؛ بە زەبری هێز ◙ زورگویی

**زۆرەملێ**[2]: ئاوەڵکار. زۆرملی؛ زۆرەملی؛ زۆرەکی؛ بە خورتی؛ بە زەبری هێز ‹زۆرەملێ دایان بە شوو› ◙ زورکی

**زۆرەوان** / zorewan/: ☜ **زۆران**

**زۆرەوانی** / zorewanî/: ☜ **زۆران**

**زۆرەوانیگر** / zorewanîgir/: ☜ **زۆرانباز**

**زۆرهان** / zorhan/: ☜ **زورهان**

**زۆری**[1] / zorî/: ناو. ۱. پـڕایی؛ زۆربە ۲. فرەیـی؛ فراوانی ‹زۆری کەشک، هی زۆری دۆیە «مەسەل»› ◙ ۱. اکثریت ۲. فراوانی

**زۆری**[2]: ئاوەڵناو. زۆراتی؛ بە خـورتی ‹زەماوەنـدی زۆری› ◙ زورکی

**زۆری**[3]: ئاوەڵکار. بە خۆرتی؛ بە زۆر ‹زۆری بردی› ◙ زورکی

**زۆرینە** / zorîne/: ناو. زۆربە ◙ اکثریت

**زۆرینەی** / zorîney/: ☜ **زۆربەی**

**زۆڕ ـ زۆڕ** / zoř zoř/: ☜ **زۆڕەزۆڕ**

**زۆڕناتک** / zořnatik/: ناو. ڕووەکێکی گەلاوردی بەهارییە و بۆ دەرمان دەشێ ◙ گیاهی است

**زۆڕە** / zoře/: دەنگەناو. دەنگـی شـین و گریـان ◙ صدای گریه

**زۆڕەزۆڕ** / zořezoř/: دەنگەناو. زۆڕـ زۆڕ؛ دەنگی لـە سەر یـەکی شـین و شـەپۆڕ و گریـان ◙ صـدای متوالی گریه و شیون

**زۆز** / zoz/: ناو. ۱. چیای هەوارگە ۲. گیایەکە لـە ئاودا دەڕوێ ◙ ۱. کوه ییلاقی ۲. گیاهی آبزی

**زۆزان** / zozan/: نـاو. زەوزان: ۱. کێـوان ۲. کوێسـتانی سـارد و بـەفرگر ۳. هەوارگـەی کۆچەران ◙ ۱. کوهستان ۲. کوهستان سرد و برفـی ۳. ییلاق

**زۆزک** / zozik/: نـاو. کوێسـتانۆکە؛ هەوارگـەی پچووک ◙ ییلاق کوچک

**زۆسان** / zosan/: ☜ **زستان**

**زۆفا** / zofa/: ☜ **زوفا**

**زۆڤ** / zov/: ☜ **زیور**

**زۆق**[1] / zoq/: ناو. بۆق؛ دەلەک؛ کاری پاڵ پێوەنان ◙ هُل

**زۆق**[2]: ئاوەڵناو. ۱. زۆپ؛ لەجێ دەرپەڕیو ۲. وشـک و زبر ۳. جووت؛ دژی تاق ◙ ۱. برجسته؛ برآمده ۲. خشک و خشن ۳. جُفت

**زۆقم** / zoqm/: ☜ **زوقمـ۱**

**زۆل** / zol/: ناو. زۆلانە؛ قـەلادەی ملـی سـەگ و تاژی لە قایش ◙ قلادەی چرمی

**زۆلاک** / zolak/: ☜ **زواڵە ـ۱**

**زۆلانە** / zolane/: نـاو. ۱. ☜ **زۆل** ۲. ئاڵـقەی زنجیر ◙ ۱. ☜ **زۆل** ۲. حلقەی زنجیر

**زۆلولاو** / zolûlaw/: نـاو. بـەلوویی؛ ڕووەکێکـی لامـژە، ڕیشـەی لـە سـەر داری بـەڕوو دەڕوێ و میوەکەی بۆ ڕەوانی باشە ◙ دارواش

**زۆڵ**[1] / zoł/: ☜ **زواڵە ـ۱**

**زۆڵ**[2]: ئاوەڵناو. ۱. *[ناشیرین]* زوێل؛ بیژوو؛ پـیچ؛ پیـژ ۲. *[پلار]* فێلباز؛ گزیکار ◙ ۱. حرامزادە ۲. حقـەبـاز؛ مکار

**زۆڵ**[3]: پێرۆ. ← **زەردوزۆڵ**

**زۆڵاخ** / zołax/: ناو. پەیاغ؛ تێلا ◙ چُماق

**زۆڵاک** / zołak/: ☜ **زواڵە ـ۱**

**زۆڵانە** / zołane/: ☜ **زەولان ـ۲**

**زۆڵک** / zołik/: ئاوەڵناو. *[پلار]* خـۆڕی و بێکـارە و بێ‌هونەر ◙ بیکارە و بی‌هنر

**زۆڵە** / zołe/: نـاو. ۱. ☜ **زۆڵـەك ـ۱** ۲. ☜ **زواڵە ـ۱**

**زۆڵەچەرم** / zoleçerm/: ناو. سیرمە؛ ڕیشاڵی باریک بڕدراو لە چەرم ≡ بُرش باریک چرم

**زۆڵەزا** / zoleza/: ئاوەڵناو. *[ناشیرین]* زۆڵ؛ بیژوو ≡ حرامزاده

**زۆڵەک** / zolek/: ناو. ١. زۆڵک؛ زۆڵە؛ دانەوێڵەی نەکڵۆک ٢. دانەی نارەسەنی ناو دەغڵ ٣. پارچەی تەنک لە گۆشت ٤. میوەی کاڵ و نەگەیشتوو ٥. ☜ زواڵە-١ ≡ ١. دانەی دیرپز ٢. نُخالە ٣. میوەی کال ۴. ورقەی نازک گوشت ۵. ☜ زواڵە-١

**زۆڵی** / zolî/: ناو. زۆڵیەتی؛ حەرامزایی؛ بیژوویی: ١. دۆخی زۆڵ بوون ٢. *[پلار]* فێڵبازی و بەدفەڕی ≡ ١. حرامزادگی ٢. شیطنت

**زۆڵیەتی** / zolyetî/: ☜ زۆڵی

**زۆم** / zom/: ناو. زوم؛ زۆمە؛ هۆبە؛ کۆمەڵە ڕەشماڵی لە دەوری یەکتر ≡ اوبە؛ ردیفی از سیاه چادرها

**زۆمپ** / zomp/: ناو. زۆنپ؛ کوتکی زلی ئاسنین بۆ بەرد شکاندن ≡ پُتک آهنی

**زۆمە** / zome/: ☜ زۆم

**زۆن** / zon/: ناو. چەوری؛ چەورایی ≡ چربی

**زۆنا** / zona/: ☜ زونا-١

**زۆنای** / zonay/: چاوگ. زانین ≡ دانستن

**زۆنپ** / zonp/: ☜ زۆمپ

**زۆنج** / zonc/: ☜ زۆنگ-١

**زۆنگ** / zong/: ناو. ١. زۆنج؛ زن؛ زنە؛ چیمەنی ئاودەڵێن ٢. باتلاغ؛ زەمینی هەمیشە قوڕ و شل ‹گوڵم! هەرێمی زۆنگ و زەل/ چلۆن دەبێتە جارەگوڵ؟! «سوارە»› ≡ ١. چمن آبزا ٢. باتلاق

**زۆنگکێش** / zongkêş/: ☜ زەنەکێش-٢

**زوو**[١] / zû/: ناو. کۆن؛ جاران؛ قەدیم؛ ئەوسا؛ پێش ئێستا ‹زەمانی زوو› ≡ قدیم؛ گذشته

▣ **بەم زوو**: ☜ بەم زووانە

**بەم زووانە**: بەم زوو؛ بەم نزیکانە؛ بەم زووییە ≡ بزودی

▣ **زوو کردن**: ئازا کردن؛ پەلە کردن ≡ عجلە کردن

**زوو**[٢]: ئاوەڵناو. ١. زی؛ بەر لە کاتی دیاریکراو ‹ئێستا زووە› ٢. لە سەرەتای کاتدا ‹بەیانی زوو› ٣. تاک؛ یەک ≡ ١و٢. زود ٣. تک

**زوو**[٣]: ئاوەڵکار. زی؛ بەلەز؛ خێرا؛ گورج؛ کرژ؛ ئازا؛ ئازانە؛ بەرقی: ١. بێ وەستان؛ بەبێ مەحتەلی ‹زوو وەرەوە!› ٢. بەر لە کاتی تەرخانکراو ‹زوو گەیشتم› ٣. بە پەلە؛ بە توندی؛ بە هەشتاو ‹زوو وەرامی داوە› ≡ ١تا٣. زود

**زوو**-[٤]: پێشوشە. گورج؛ دەسبەجێ ‹زووخێز؛ زووتوڕ› ≡ زود -

**زوو**[٥]: پیرۆ. ← زاوزوو

**زووبر** / zûbir/: ئاوەڵناو. تەخت؛ ڕاست ≡ هموار

**زووبشکێ** / zûbişkê/: ئاوەڵناو. قرچەک؛ قرچۆک؛ تایبەتمەندی دارێ کە زوو دەشکێ ≡ ویژگی چوبی کە زود بشکند

**زووبەزوو** / zûbezû/: ئاوەڵکار. ١. زوو وە زوو؛ هەر زوو ‹بڕۆ، زووبەزوو وەرەوە!› ٢. زوو - زوو؛ پەیتا - پەیتا؛ بە مەودای کەمەوە ‹زووبەزوو دێ سەرمان ئەدا› ≡ ١. زود ٢. زود بە زود

**زووبین** / zûbîn/: ☜ زەڕگ-٢

**زووبینا** / zûbîna/: ئامراز. جگە لەو یەکە ≡ بجُز آن

**زووپس** / zûpis/: ئاوەڵناو. پسۆک؛ ناپتەو ≡ سُست

**زووت** / zût/: ئاوەڵناو. ڕووتوقووت؛ زەڵووت ≡ عُریان

**زووتاو** / zûtaw/: ئاوەڵناو. زووگوێر؛ زووهەرس ≡ زودهضم

**زووتۆر** / zûtor/: ئاوەڵناو. تۆرینۆک؛ کەمجیقەڵدان؛ دڵناسک؛ خۆڕانەگر لە هەمبەر ئاکار و کردەوەی ناحەزی خەڵکەوە ≡ زودرنج

**زووتە** / zûte/: ناو. ڕابردوو؛ ڕابردە ≡ گُذشته

**زوحەل** / zûĥel/: ☜ **زوگویر**

**زووخ**[1] / zûx/: ناو. ١. ☜ **زۆخ**[1] ٢.[مەجاز] ئازار و ئەشکەنجە ▤ ١. ☜ **زۆخ** ٢. شکنجە

⊡ **زووخ پێ دان**: ☜ **زووخاو پێ دان**

**زووخ**[2]: ☜ **زۆخ**[2]

**زووخاڵ** / zûxał/: ☜ **خەڵووز**

**زووخاو** / zûxaw/: ناو. ١. کێم و خوێنی تێکەڵاو ٢.[مەجاز] ئازار؛ ئەستەم ▤ ١. چرک و خونابە ٢. زجر

⊡ **زووخاو پێ دان**: زووخ پێ دان؛ ئازار دان؛ چەوساندنەوە ▤ زجر دادن

**زووخاو نۆشین**: ئێش و ئازار چەشتن ▤ درد و رنج کشیدن

**زووخاو هەڵێنان/ هەڵهاوردنەوە**: دەربڕینی هۆی خەمبار بوون و چۆنیەتی ڕەنج و ئازاری بە سەردا هاتوو ▤ دردِل کردن

**زووخاوکوژ** / zûxawkuj/: ناوەڵناو. [مەجاز] بە ئازاری زۆرەوە کوژراو ▤ زجرکُش

⊡ **زووخاوکوژ بوون**: زووخ و ئازاری زۆر دیتن ▤ زجرکُش شدن

**زووخاوکوژ کردن**: زووخ و ئازاری زۆر پێ دان ▤ زجرکُش کردن

**زووخاوەزگ** / zûxawezig/: ☜ **زووخاوەسک**

**زووخاوەسک** / zûxawesik/: ناو. [مەجاز] زووخاوەزگ؛ ئازار؛ ئەستەم ▤ آزار و اذیّت

⊡ **زووخاوەسک کردن**: زووخ پێ دان؛ ئازار دان؛ چەوساندنەوە ▤ زجر دادن

**زووخاوەسک بوون**: ئێش و ئازار چەشتن ▤ درد و رنج کشیدن

**زووخ پێدڕاو** / zûxpêd(i)raw/: ناوەڵناو. کونەجەرگ؛ جەرگدڕاو ▤ زجرکشیدە

**زووخۆر** / zûxor/: ناوەڵناو. بلەز لە خواردن؛ لە خواردنا پەلەکەر ▤ عجول در خوردن

**زووخێز** / zûxêz/: ناوەڵناو. ١. سەحەرخێز ٢. گورج؛ گورج‌وگۆڵ؛ تایبەتمەندی کەسێ کە لە هەر کارێکدا خێرا دەجووڵێ ▤ ١. سحرخیز ٢. چابُک

**زوور**[1] / zûr/: ناو. ١. ☜ **زۆر**[1] ٢. ☜ **زووران ـ٢**

**زوور**[2]: ناوەڵناو. ١. ☜ **زبر** ٢. ☜ **زۆر**[2] ٣. خەمبار و کز ٤. زویر؛ ناقایل؛ تۆراو ▤ ١. ☜ **زبر** ٢. ☜ **زۆر**[2] ٣. غمگین ٤. آزردە

⊡ **زوور بوون**: ١. دڵ ئێشان؛ ڕەنجیان ٢. ڕوانین بە چاوی زەق ▤ ١. آزُردن ٢. خیره شدن

**زووران** / zûran/: ناو. ١. زورکان؛ زوورک؛ زوورکان؛ زورگە؛ زوورگە؛ زەوینی زبر و بەرداوی ٢. زوور؛ تەپۆلکەی پچووکی ڕووتەن لە دەشتاییدا ▤ ١. زمین سنگلاخ ٢. تپەی کوچک در دشت

**زوورانەوە** / zûranewe/: چاوگ. خوورین و سووتانەوەی پێست ▤ خاریدن و سوزش داشتن پوست

**زووربا** / zûrbak/: ناو. ڕەشەبا؛ بای زۆر بەهێز ▤ تُندباد

**زوورچک** / zûrçik/: ناو. گردۆولەی ڕەملی پچووک ▤ تپەی ماسەای کوچک

**زوورچە** / zûrçe/: ناو. زووزە: ١. چێشتی پەنیری وشک کە لە ئاودا دەیکوڵێنن ٢. چێشتی کەشکاو ▤ ١. آش پنیر ٢. آش کشک

**زوورک** / zûrik/: ناو. ☜ **زووران ـ١**

**زوورکان** / zûrkan/: ☜ **زووران ـ١**

**زوورگە** / zûrge/: ☜ **زووران ـ١**

**زوورو** / zûrû/: ناو. خۆڵەمێشی خوری و موو ▤ خاکستر پشم و مو

**زووروشک** / zûrûşk/: ناوەڵناو. [پلار] نەفام؛ گەوج ▤ ابلە

**زوورە** / zûre/: ناو. ١. بەردێکی زبرە چەقۆی پێ تیژ دەکەن ٢. لوورەی گورگ ٣. ☜ **زبرە** ▤ ١.

سنگ سوهان ٢. زوزه ٣. ☜ زبره

**زوره‌ئاوی** / zûre'awî/: ناو. زبره‌ی ئاوی؛ زبره‌یه‌ک که بۆ تیژ کردنی تیخ ته‌ڕی ده‌که‌ن ☰ نوعی سنگ سُنباده

**زوره‌با** / zûreba/: ناو. بای سوور؛ نه‌خۆشییه‌کی چلکی و گرانی پێست و شانه‌کانی ژێر پێسته ☰ بیماری باد سُرخ

**زوره‌ک و دوبه‌لا** / zûrek û dûbela/: ئاوه‌ڵکار. به حاسته‌م؛ وه حاڵێک؛ به سه‌وری؛ زۆر به ئه‌سپایی ☰ آهسته؛ یواشکی

**زوری** / zûrî/: ناو. مووماڕ؛ مۆڵک؛ مارمارک؛ کرمه‌پانه؛ کرمێکی پان و زۆر درێژه، چوار قولاپی به سه‌ره‌وه، ئه‌گه‌ر گه‌راکه‌ی بگاته ناو ڕیخۆڵه‌ی گیانه‌وه‌ر، له‌وێدا خۆی ده‌گرێ و گه‌وره ده‌بێ ☰ کرم کدو

**زورین** / zûrîn/: چاوگ. لووراندن ☰ زوزه کشیدن

**زوراب** / zûřab/: ئاوه‌ڵناو. زووخێز؛ سه‌حه‌رخێز؛ هۆگر و خووگرتووی زوو له خه‌و ڕابوون ☰ سحرخیز

**زوڕنای** / zûřnay/: چاوگ. ١. زووڕه‌زووڕ کردن ٢. زیڕاندن ☰ ١. زاریدن ٢. جیغ کشیدن

**زوڕه** / zûře/: ناو. حیله‌ی چوارپێ ☰ شیهه‌ی ستور

**زوڕه‌زوڕ** / zûřezûř/: ناو. قووڕه‌قووڕ؛ گریان و شیوه‌ن به ده‌نگی به‌رز ☰ بلند گریستن

**زوڕه‌س** / zûřes/: ئاوه‌ڵناو. زووڕه‌سه؛ ڕه‌بت؛ ڕه‌بیت؛ جه‌دماد؛ ئه‌نروک؛ ناده؛ به تایبه‌تمه‌ندی زوو پێگه‌یین ‹گه‌ر له ئه‌وه‌ڵ ده‌فعه‌وه ئه‌م فرسه‌ته نه‌فعی نه‌بێ/ میوه ئاخر خۆشه، مه‌یلی به‌رسیله‌ی زووڕه‌س مه‌که «قانع»› ☰ زودرس

**زوڕه‌سه** / zûřese/: ☜ زوڕه‌س

**زوڕیای** / zûřyay/: چاوگ. ١. زاریان؛ شیوه‌ن کردن ٢. قیژه و هه‌را کردن ☰ ١. زاریدن ٢. جیغ و داد کشیدن

**زوو** ـ **زو** / zû zû/: ئاوه‌ڵکار. ١. زۆر به په‌له؛ گه‌له‌کی بله‌ز ٢. زۆر له مێژینه؛ له ڕابردووی دووردا ٣. په‌یتا ـ په‌یتا؛ به مه‌ودای که‌مه‌وه ‹زوو ـ زوو چاومان به یه‌ک ئه‌که‌وێ› ☰ ١. فوراً ٢. پیشتر ٣. زود به زود

**زوزه** / zûze/: ☜ زورچه

**زوسان** / zûsan/: ☜ زستان

**زوغور** / zûğur/: ناو. گورچیله؛ ولک ☰ کلیه

**زوف** / zûf/: ☜ زولف

**زوفا** / zûfa/: ناو. گیازلفان؛ زلفان؛ زۆفا؛ گیایه‌کی پایا و بۆنخۆش که ده‌رمانه ☰ زوفا

**زوق** / zûq/: ده‌نگه‌ناو. زاق؛ ده‌نگی به‌رز و تیژی منداڵ ☰ صدای زیر و بلند بچه

**زوقاندن** / zûqandin/: ☜ زورکاندن

**زوقه** / zûqe/: ☜ زورکه

**زوکوڵ** / zûkuł/: ئاوه‌ڵناو. خۆش‌کوڵ؛ به‌کڵۆک؛ به تایبه‌تمه‌ندی خێرا و خۆش کولانه‌وه ‹نیسکی زووکوڵ› ☰ زودجوش؛ زودپز

**زوکوڵێن** / zûkułên/: ئاوه‌ڵناو. به تایبه‌تمه‌ندی زوو هێنانه کوڵه‌وه ‹سه‌ماوه‌ری زووکوڵێن› ☰ زودپز

**زوکه‌زوک** / zûkezûk/: ناو. ناڵه‌ناڵ به ده‌نگێکی کز و ناسکه‌وه ☰ صدای زیر ناله و زاری

**زوگر** / zûgir/: ☜ زوگرس

**زوگرس** / zûgirs/: ئاوه‌ڵناو. زووگر؛ به تایبه‌تمه‌ندی زوو سفت بوونه‌وه و خۆ گرتنه‌وه ‹سمنتی زووگرس› ☰ زودگیر

**زوگوێر** / zûg(i)wêr/: ئاوه‌ڵناو. زووحه‌ل؛ زووهه‌رس؛ سووک؛ زووتاو؛ به تایبه‌تمه‌ندی زوو هه‌ڵتوانه‌وه ☰ زودهضم

**زوگور** / zûgûr/: ئاوه‌ڵناو. پێدڤی؛ پێویست ☰ لازم

**زوگورت** / zûgûrt/: ☜ زگورد

**زوگین** / zûgîn/: ئاوه‌ڵناو. زوویین؛ زووینگ؛ پێشوونه ☰ دیرینه

**زووم** / zûm/: ناو. جۆرێ نیسكۆی دووربینی وێنەگری و فیلم هەڵگرتن بە مەودای ناوەندی بگۆڕەوە ☰ زوم

▣ **زووم كردن**: ۱. كاری گۆڕینی مەودای ناوەندی نیسكۆی دووربین بۆ بەرامبەركردنی لەگەڵ بابەتی ویستراوی وێنەگر یان فیلمگر و دەرخستنی لە ناو چوارچێوەدا ۲. [مەجاز] ماق بوون؛ زۆر سەرنج دان ☰ ۱. زوم كردن ۲. خیره شدن

**زوونووس** / zûnûs/: ئاوەڵناو. شەما؛ توندنووس ☰ تندنویس

**زووانە** / zûwane/: ئاوەڵكار. زوویيانە ☰ زود

**زووهەرس** / zûhers/: ☜ زووگوێر

**زووهەڵبەست** / zûhełbest/: ئاوەڵناو. دەسبەجێ؛ بێ بیركردنەوە ☰ فی‌البداهه

**زووير** / zuwîr/: ☜ زوير

**زوويری** / zuwîrî/: ☜ زويری

**زوويەڵە** / zûyełe/: ☜ زیەڵی

**زوویی** / zûyî/: ناو. دۆخ و چۆنیەتی زوو بوون ‹دێر و زوویی گرنگ نییە› ☰ زودی

**زوویيانە** / zûyîyane/: ئاوەڵكار. زووانە (تێبینی: ئەم وشە بە تەنیا ناگوترێ و «بەم» یان «بەو» وەكوو پێشگر، ڕەگەڵی دەكەوێ) ☰ زودی‌ها

**زووين** / zûyîn/: ☜ زووگين

**زووينگ** / zûyîng/: ☜ زووگين

**زە** / ze/: ناو. ۱. ژن؛ ئافرەت ۲. ژە؛ ژنێ؛ ڕیخۆڵەی بادراوی چوارپێ ☰ ۱. زن ۲. زه

**زەب** / zeb/: ئاوەڵناو. ۱. ڕەپ؛ زۆپ ۲. ڕەق؛ سەخت ☰ ۱. برجسته ۲. سخت

**زەباد** / zebad/: ناو. ۱. گیانەوەرێكی وەك پشیلەیە، بە پێستی خۆڵەمێشی ڕێ ـ ڕێوە، لە ژێر كلكیدا لكێكی هەیە و لەوێوە ماكێكی بۆنخۆش دەدەڵێنێ، لە عەترسازیدا بە كەڵك دێ ۲. ناوی ئەو ماكە بۆنخۆشە ☰ ۱و۲. زباد

**زەبارە** / zebare/: ☜ زبارە

**زەباندن** / zebandin/: چاوگ. ۱. لەپاندن؛ هەڵفریواندن ۲. ئەنراندن؛ ئاراندن؛ ئازار دان ☰ ۱. فریفتن ۲. آزردن

**زەبت** / zebt/: ناو. زەفت: ۱. داگیركاری؛ ڕەوتی دەست بە سەردا گرتن ۲. دەزگای تۆمار كردن و خوێندنەوەی دەنگ ☰ ۱. غصب ۲. ضبط صوت

**زەبر** / zebr/: ناو. ۱. كاری لێدان؛ لێخستن ‹بە یەك زەبر خستی› ۲. گوشار؛ كاری بە نهێم داگرتن ‹زەبری برسییەتی زۆر كار بە پیاو دەكا› ۳. توانایی؛ تاقەت ☰ ۱. ضربت ۲. فشار ۳. قوّت و توان

**زەبربەدەست** / zebrbedest/: ئاوەڵناو. ۱. خەورت؛ بەهێز و توان ۲. كارامە لە زانینی كاردا ☰ ۱. نیرومند ۲. ماهر

**زەبردار** / zebrdar/: ئاوەڵناو. ۱. بەهەیبەت؛ سامناك؛ تایبەتمەندی ئەوەی خەڵك لێی بترسن ۲. زۆر بەهێز ☰ ۱. سهمگین ۲. نیرومند

**زەبروزەنگ** / zebr û zeng/: ناو. توندی؛ گوژم ‹بە زەبروزەنگی نە پەل ما نە مەل/ بە غوولی جەنگی كێ بێ بلێ لەل؟! «حەقیقی»› ☰ شدّت

**زەبرە** / zebre/: ناو. فایدە و بەهرەی تەوژم دان ☰ بهره و نتیجه‌ی فشار

**زەبرەبەند** / zebrebend/: سارستە. زەهرەمار؛ سندان ☰ زهرمار؛ دُشنامی است

**زەبرەقوون** / zebreqûn/: ☜ زەبرەقوونە

**زەبرەقوونە** / zebreqûne/: ناو. [كینایە] زەبرەقوون؛ زەربەقوون؛ زەربەقوونە؛ هێلكە ☰ تخم‌مرغ

**زەبلك** / zeblik/: ناو. بەلەك؛ لەتەر ☰ ساق پا

**زەبلۆق** / zebloq/: ئاوەڵناو. زەبەلۆق؛ حولی؛ لووس و ساف لە دەستان ☰ صاف

**زەبلەك** / zeblek/: ناو. ۱. ماسوولەی گۆشت ۲. ڕیخۆڵەی ئەستوور ☰ ۱. عضُله ۲. روده‌ی بزرگ

**زەبون** / zebûn/: ئاوەڵناو. ١. كز و لاواز ٢. بێچارە و فەقیر ٣. زوێن؛ بەزیو و تەزیو لە درێژەدانی ملە ٤. پەست؛ خوار؛ كوورە؛ كووره؛ ئابڕووتكاو؛ ئابڕوونەماو ٥. داماو؛ دەسەوەستان؛ دەسەپاچە؛ بێدەسەڵات ☰ ١. لاغر مردنی ٢. بیچارە ٣. زبون ۴. بی‌آبرو ۵. درمانده

**زەبەر** / zeber/: ناو. سەرە؛ نیشانەیەكی بزاوی لە شێوە نووسینی فارسی و عەرەبیدا كە بكەوێتە سەری هەر پیتێک، دەنگی «ە/ ـە»ی پێ دەدا ☰ فتحە؛ زَبَر

**زەبەرجەد** / zeberced/: ناو. بەرزەڕێنە؛ بەردێكی زەردی ئاماڵ سەوزی بەقیمەتە و دەتروسكێ، دەیكەنە نقێم و قاش؛ ☰ زَبَرجَد

**زەبەردەست** / zeberdest/: ئاوەڵناو. لێزان؛ كارامە ☰ زَبَردست

**زەبەردەستی** / zeberdestî/: ناو. دەگەر؛ مەهارەت ☰ مهارت

**زەبەز** / zebez/: ☜ زەبەش

**زەبەژ** / zebej/: ☜ زەبەش

**زەبەش** / zebeş/: ناو. زەبەژ؛ زەبەز؛ زەربەش؛ جەبەش؛ جەبەژ؛ ژەبەش؛ ژەبەژ؛ شووتی؛ شفتی؛ شامی؛ شتی؛ شووتوو؛ سمتوو؛ هەنی؛ هندی: ١. شەتڵە گیایێ لە تیرەی خەیار، بە گەڵای شەقار-شەقار، لاسكی خەوتوو، گوڵی زەرد و میوەی ئاوداری خۆراكییەوە ٢. میوەی خڕ و درشتی ئەو گیایە بە توێكڵێكی ئەستووری سەوز، گۆشتی سوور یان زەردی شیرین و ئاودارەوە كە دەنكەكانی تێیدا بلاون ☰ ١و٢. هندوانە

**زەبەلاح** / zebelaĥ/: ئاوەڵناو. زەبەلاع؛ زەبەلۆح؛ زەبەلۆع: ١. *[پلار]* زلحۆرت؛ تەزەی ناقۆلا ٢. زۆر گەورە ‹باخێكی زەبەلاح› ☰ ١. دُرُشت بدقوارە ٢. بسیار بزرگ

**زەبەلاحی** / zebelaĥî/: ناو. گەورەیی؛ زلی ‹ماڵ بە زلی و زەبەلاحی نییە، بە بەر و بەرەكەتە› ☰ بزرگی

**زەبەلاع** / zebela'/: ☜ زەبەلاح

**زەبەلۆح** / zebeloĥ/: ☜ زەبەلاح

**زەبەلۆع** / zebelo'/: ☜ زەبەلاح

**زەبەلۆق** / zebeloq/: ☜ زەبلۆق

**زەبەن** / zeben/: ☜ زەبەند

**زەبەند**[1] / zebend/: ناو. زەبەن؛ زەبەندە؛ زەبەنگ؛ زەوەن؛ زەوەند ☰ نیزار انبوه

**زەبەند**[2]: ئاوەڵناو. زەبەن؛ زەبەندە؛ زەبەنگ؛ زەوەن؛ زەوەند: ١. زۆر؛ فرە؛ بۆش ‹داراییەكی زۆر و زەبەندی كۆ كردەوە› ٢. چڕ؛ پڕ؛ تژی ‹دۆڵی كپ و چەمی خوڕت/ دارستانی زەبەند و چڕت «گۆران»› ☰ ١. زیاد ٢. انبوه

**زەبەندە** / zebende/: ☜ زەبەند

**زەبەنگ** / zebeng/: ☜ زەبەند

**زەبی** / zebî/: ناو. ڕەقی؛ سەختی؛ گرژی ☰ سختی؛ سفتی

**زەپ** / zep/: ئاوەڵناو. ١. زۆپ؛ قووت ٢. تەزەی ئەستوور ☰ ١. برجستە ٢. لندهور

**زەپرتی** / zepirtî/: ئاوەڵناو. ١. بزۆز؛ ئۆقرەنەگر ٢. لەجەر؛ لاواز ☰ ١. عجول ٢. زِپرتی

**زەپزەپە** / zepzepe/: ☜ زلحۆل

**زەپەزەپ** / zepezep/: ئاوەڵناو. دارماڵ؛ تژە؛ تەواو پڕ ☰ مالامال

**زەجر** / zecr/: ناو. ئێش؛ ئازار ☰ زجر

⊡ **زەجر دان**: زەجر كردن؛ ئەشكەنجە دان ‹موددەعی زەجرم دەكات و پێم دەڵێ: سەبرت بێ!/ كەر بە لەعنەت بێ كە كەی عاشق قەراری گرتووە! «نالی»› ☰ شكنجە دادن

**زەجر كردن**: ☜ زەجر دان

**زەجرەبە** / zecrebe/: ناو. جەزرەبە؛ ئازار؛ ئەشكەنجە ☰ شكنجە

**زەچ**[1] / zeç/: ناو. زچ؛ جۆرێ گەمە بە ورتكەبەرد ☰

نوعی بازی با شن

**زەچ**[٢]: ئاوەڵناو. [پلار] خوێنتاڵی خۆ نزیکەوەکەر ☰ گرانجانِ مُزاحم

**زەچە / zeçe/**: ئاوەڵکار. بۆچی؛ لە بەر چی ☰ از چه؛ چرا

**زەحف / zeĥf/**: ئاوەڵناو. زۆر؛ فرە؛ بۆش ☰ بسیار

**زەحلە / zeĥle/**: ناو. کیسەی زراو ☰ کیسەی صفرا

**زەحمەت**[١] **/ zeĥmet/**: ناو. ١. مەینەت؛ ئەمەک؛ زامەت ٢. ئازار ☰ ١. زحمت ٢. اذیت

▣ **زەحمەت دان**: ئەزیەت دان؛ ڕەنج پێ دان؛ کاری دژوار خستنە سەر شانی کەسێک ☰ زحمت دادن

**زەحمەت کێشان**: ڕەنج دان؛ ئەرکی گران جێبەجێ کردن ☰ زحمت کشیدن

**زەحمەت**[٢]: ئاوەڵناو. دژوار؛ ئەستەم ‹لابردنی ئەم هەموو هەڵە زەحمەتە› ☰ سخت؛ دشوار

**زەحمەتکێش**[١] **/ zeĥmetkêş/**: ناو. کرێکار ‹ڕۆژی جیهانی زەحمەتکێشان› ☰ کارگر

**زەحمەتکێش**[٢]: ئاوەڵناو. ١. ڕەنجدەر؛ ڕەنجبەر؛ هەڵگری ڕەنج و سەختی لە کاردا ٢. خاوەن پیشەی سەخت و پڕئازار ☰ ١و٢. زحمتکش

**زەحیر / zeĥîr/**: ☜ **زکەشۆرە**

**زەحیری / zeĥîrî/**: ناو. ڕیتڕیتۆک ☰ اسهالی

**زەخ / zex/**: ئاوەڵناو. زل؛ زەلام؛ مەزن ☰ گُنده

**زەخت / zext/**: ناو. زەختە؛ زیخت: ١. نەقیزە ٢. سوخورمە؛ مستەکۆڵە ٣. مامزە؛ دەرزیک؛ ئاسنۆکەی پاشپانییەی سوار بۆ تاودانی ئەسپ ٤. تەوژم؛ گوشار ‹زەختی خوێن› ☰ ١. سُک؛ سیخونک ٢. سُقُلمه ٣. مهمیز ٤. فشار

**زەختە / zexte/**: ☜ **زەخت**

**زەختی / zextî/**: ناو. بارگرانایی؛ ئەرک و زەحمەتی زۆر ☰ رنج بسیار

**زەختین / zextîn/**: ناو. گیای تازە ڕواو ☰ گیاه تازه سر درآورده

**زەخفە / zexfe/**: ناو. گۆشتی ژێر پلاو ☰ گوشت زیر پلو

**زەخم**[١] **/ zexm/**: ناو. ١. چیای سەخت و دژوار ٢. زەخمەل؛ زەخمەڵ؛ زام؛ برین ☰ ١. کوه دشوارگُذر ٢. زخم

**زەخم**[٢]: ئاوەڵناو. [پلار] زەلام؛ گەپ؛ ملقەوی ☰ گُنده

**زەخمار / zexmar/**: ئاوەڵناو. زامار؛ بریندار ☰ زخمی

**زەخمپێچی / zexmpêçî/**: ☜ **برینپێچی**

**زەخمک / zexmik/**: ناو. چەرمێ کە ئاوزەنگی تێدایە؛ قایشی ئاوزەنگی ☰ چرم رکاب‌بند

**زەخمو / zexmû/**: ئاوەڵناو. زامار؛ بریندار ☰ زخمی

**زەخمە / zexme/**: ناو. ١. پێژەن؛ دەنووکە؛ لەتەیەکی پچووک و باریک بۆ ژەندنی سازی ژێدار ٢. ☜ **سوخمە ـ١** ☰ ١. زخمە ٢. ☜ **سوخمە ـ١**

**زەخمەل / zexmel/**: ☜ **زەخم**[١]**ـ٢**

**زەخمەڵ / zexmeł/**: ☜ **زەخم**[١]**ـ٢**

**زەخەرە / zexere/**: ناو. ئاسەڕ؛ بەرکەوا ☰ آستر

**زەخەڵ / zexeł/**: ئاوەڵناو. ١. دەغەڵ ٢. قەڵب؛ زڕ ☰ ١. ناروزن ٢. بدلی

**زەخیرە / zexîre/**: ناو. پاشەکەوت؛ پاشەکەفت: ١. پەسمەنە؛ ئەوەی کۆ بووبێتەوە ٢. پاشخراوە؛ ئەوی کۆ کرابێتەوە ☰ ١. اندوخته ٢. پس‌انداز

**زەدار / zedar/**: ئاوەڵناو. هاوسەردار؛ خاوەن ژن یان شوو ☰ مُتأهل

**زەدە**[١] **/ zede/**: ناو. عەیب لە کووتاڵ و ماڵی کڕیاریدا ‹ئەو ئیسکانە لابە! زەدەی هەیە› ☰ عیب؛ زده

**زەدە**[٢]: ئاوەڵناو. ١. زیانلێکەوتوو؛ گەزەندیتوو ‹ئیسکانی زەدە› ٢. حاڵخراپ؛ پەرێشان ‹ئێستە گیرۆدەی مەقامی پیریم/ زەدەی زەمانەی بەزم

زویریم «قانع»› ☰ ١. آسیب‌دیده ٢. پریشان

**زەدەدار** / zededar/: ناوەڵناو. عەیبدار ☰ زده‌دار؛ معیوب

**زەدەسیری** / zedesîrî/: ☜ **زەردەسیری**

**زەدەواڵە** / zedewałe/: ناو. گونجەزەردە؛ زەرگەتە ☰ زنبور زرد

**زەر** / zer/: ☜ **زەرد**[1]

▣ **زەری قیچ**: زەردی ئاچخ ☰ زرد روشن

▣ **زەر کرن**: ☜ **زەرد کردن**

**زەراڤ** / zerav/: ☜ **زراو**[1]_١

**زەراڤە** / zerave/: ناو. کونی دیوار؛ کون دە دیواردا ☰ سوراخ دیوار

**زەران** / zeran/: ☜ **زریان**

**زەرانیق** / zeranîq/: ناو. حەلەق ـ مەلەق؛ ئەمسەرـ ئەوسەر؛ حیندرحۆ ☰ الاکُلنگ

**زەراهی** / zerahî/: ناو. زەرایی؛ زەردی؛ زەردایی؛ ڕەنگ ئاڵتوونی ☰ زردی

**زەرایی** / zerayî/: ☜ **زەراهی**

**زەرب** / zerb/: ناو. زەبر ☰ ضربت

**زەرباڤ** / zerbav/: ناو. زەردۆڵە؛ زەردەجوڕە؛ زەردەزوڕە؛ زەردەزیڕە؛ زەردەوەرە؛ زەردەوەلی؛ زەردەیزڕە؛ زەردیوەرە؛ زەردیوەری؛ زەردیوەلی؛ زەردیلە؛ زەرویلە؛ زەرۆیلە زەریلە؛ زەردەواڵە؛ مەلێکی پچووکە لە تۆرەمەی سوورە، نزیکی ١٦ سانتیمیترە، نێرکەی بەر زگی تەواو زەردە، سەری ڕەشە و تۆقی ملی زەردە، پشتی شێ ڕەنگە، کلکی تووکی سپی تێدا نییە، پاییزان سەری قاوەیی هەڵدەگەڕێ، مێیەکەی پشتی قاوەیی زەیتوونی ڕێ ـ ڕێیە و بەر زگی خەت و خاڵی نییە تووکی ژێر پاشەڵی زەردە، لە نێو پنچکان هێلانە ساز دەکا، هاوینان زۆر دەبینرێت ☰ زرده‌پره سر سیاه

**زەرباو** / zerbaw/: ☜ **زەردباو**

**زەربەت** / zerbet/: ناو. دەرب؛ زەبر ☰ ضربت

**زەربەش**[1] / zerbeş/: ناو. ١. ☜ **زەبەش** ٢. ڕەنگی ئاماڵ‌زەرد ☰ ١. ☜ **زەبەش** ٢. رنگ مایل به زرد

**زەربەش**[2]: ☜ **زەردباو**

**زەربەقوون** / zerbeqûn/: ☜ **زەبرەقوونە**

**زەربەقوونە** / zerbeqûne/: ☜ **زەبرەقوونە**

**زەربی** / zerbî/: ☜ **زەردەبی**

**زەرپ** / zerp/: ناو. زەرپان: ١. زەبر؛ کاری لێدان ٢. چۆنیەتی کوتران ٣. تەوژم؛ هێز و گوشار ‹دەسم زەرپی نەماوە› ☰ ١. ضربت ٢. کوفتگی ٣. قدرت

**زەرپان** / zerpan/: ☜ **زەرپ**

**زەرپانن** / zerpanin/: چاوگ. زرەپنای؛ لێدان؛ لێخستن؛ کوتان ☰ زدن؛ کوفتن

**زەرپچی** / zerpiçî/: ناوەڵناو. ڕەنگ‌زەرد و لاواز ☰ زرد و ضعیف

**زەرپە** / zerpe/: ناو. لەتمە؛ زیان ☰ لطمه؛ ضربه

**زەرپیان** / zerp(i)yan/: چاوگ. لێدران؛ کوتران ☰ زده شدن؛ کوفته شدن

**زەرپیز** / zerpîz/: ناو. چەشنێ نەخۆشی پێستی چەتوون و میکرۆبی کە وەک بلۆقی چلکی دەردەکەوێ ☰ زردزخم

**زەرتاڵ** / zertał/: ناو. زەرداو؛ زەردکاو؛ زەرداوی ڕشانەوە ☰ زردابه‌ی قی

**زەرتک** / zertik/: ناو. ١. گیایەکە بەنی پێ زەرد دەکەن ٢. بن گەڵای توتن ٣. زەردێنە؛ زەرایی ناو هێلکە ٤. زەرک؛ جۆرێ ترێ ٥. زەردی؛ زەردوویی ☰ ١. گیاهی که نخ را با آن زرد کنند ٢. برگ زیرین توتون ٣. زرده‌ی تخم‌مرغ ۴. نوعی انگور ۵. یرقان

**زەرتکە** / zert(i)ke/: ناو. جۆرێ گەنمی درشت و زەرد ☰ نوعی گندم مرغوب

**زەرتڵاق** / zert(i)łaq/: ناو. ترس؛ سام ☰ ترس

**زەرتەلاق** / zerteław/: ☜ **زاڵەتەوەك**

**زەرچی** / zerçî/: ناو. هەوەڵین سەوزایی کە بەهاران دەردێت ☰ اولین سبزەی بهاری

**زەرحات** / zerĥat/: ناو. شیناوەرد؛ بێستان ☰ جالیز

**زەرد**[١] / zerd/: ناو. زەر: ١. یەکێ لە ڕەنگە سەرەکییەکان لە شێوەی ڕەنگی لیمۆی گەییو، گوڵی ڕۆجیارپەرست یان زەردەچێوە کە دەکەوێتە نێوان ڕەنگی کەسک و نارنجییەوە ٢. تیشە شاخی زۆر بلند ‹هات لە ڕەوەز و زەردان/ قاسپەی کەوی سەر بەردان «هێمن»› ٣. برنج؛ چەشنێ ئالیاژی زەرد ☰ ١. زرد ٢. صخرەی بسیار بلند ٣. آلیاژ برنج

**زەرد**[٢]: ئاوەڵناو. ١. زەر؛ بە ڕەنگی ئاڵتوون ‹قژی زەرد› ٢. *[کینایە]* کز؛ نەخۆش ☰ ١و٢. زرد

▣ **زەرد بون:** *[کینایە]* ١. تازە پێ گەیشتنی خەڵە ٢. لە سەر دەربوونی کوان ٣. ڕەنگ پەڕین ☰ ١. رسیدن غلە ٢. شروع باز شدن دهانەی دُمل ٣. رنگ باختن

**زەرد کردن:** زەر کرن: ١. گیا لە ئاوی گەرمدا نیوەکوڵ کردن ٢. بە زەرد ڕەنگاندن ٣. ڕەنگ پەڕین بە هۆی ترسان ☰ ١. تفت دادن گیاه ٢. زرد رنگ کردن ٣. رنگ باختن از ترس

**زەرد هەڵگەڕان:** زەرد بوون؛ ڕەنگ پەڕین؛ لاواز بوون ‹بە سەرگەردت بم تەڵەکەی ڕاوی/ بە ڕۆژوو مەبە زەرد هەڵگەڕاوی «فولکلۆر»› ☰ رنگ باختن

**زەردالگ** / zerdalig/: ☜ **زەرگەتە ـ٢**

**زەردالی** / zerdalî/: ناو. زەردەڵوو: ١. زەردلی؛ زەردەلی؛ شێلانە؛ زەردالوو ٢. قەیسی؛ زەردەلی وشکەوەکراو ☰ ١. زردالو ٢. قیسی؛ برگەی زردآلو

**زەرداڵو** / zerdałû/: ناو. هەڵووچە پایزە؛ حەلۆکازەر؛ زەردالوو ☰ زردآلو

**زەرداو** / zerdaw/: ☜ **زەرتاڵ**

**زەردایی** / zerdayî/: ☜ **زەراهی**

**زەردباو** / zerdbaw/: ئاوەڵناو. زەرباو؛ ئامال زەرد؛ زەربەش ☰ متمایل بە زرد

**زەردپۆس** / zerdpos/: ☜ **زەردپێست**

**زەردپێست** / zerdpêst/: ئاوەڵناو. زەردپۆس؛ پێوەندیدار یان سەر بە یەکێ لە چوار گرۆی گەورەی ڕەگەزی مرۆ، خەڵکی ڕۆژهەلاتی دوور، بە پێستی زەرد، چاوی کێشراو و قژی ڕەش و سافەوە ☰ زردپوست

**زەردکاو** / zerdkaw/: ناو. ١. زەلکۆ؛ قۆپی؛ باتلاغ و قامیشەلێن ٢. ☜ **زەرتاڵ** ☰ ١. نیزار باتلاقی ٢. ☜ **زەرتاڵ**

**زەردکی** / zerd(i)kî/: ☜ **زەردێتە**

**زەردلی** / zerdlî/: ☜ **زەردالی ـ١**

**زەردماه** / zerdmah/: ناو. وەرزاخ؛ شاخی زۆر سەخت و ئەستەم ☰ کوه سنگی بسیار سخت

**زەردوزملیق** / zerd û zimlîq/: ناو. زەرد و لووس ☰ زرد و صاف

**زەردوزۆڵ** / zerd û zoł/: ئاوەڵناو. زۆر جوان و ناسک ☰ زیبا و دلپسند

**زەردوسور** / zerd û sûr/: ناو. ١. *[مەجاز]* منداڵانی جوانکیلە ٢. کۆلکەزێرینە؛ پەلکەڕەنگینە ☰ ١. بچەهای زیبا ٢. رنگین‌کمان

**زەردوماه** / zerd û mah/: ناو. شاخی بەرز و ئەستەم؛ ڕەوەزی ڕژد و بەرز ‹گەییشتمە سەر ترۆپکی ئارەزوو ڕۆژێ، کە چی ڕوانیم/ لە پێشمدایە زەردوماه و سەخت و ئەستەمێکی تر «هێمن»› ☰ صخرەی بلند و دشوارگُذر

**زەردۆڵە**[١] / zerdołe/: ☜ **زەرباف**

**زەردۆڵە**[٢]: ☜ **زەردوڵە**

**زەردوڵە** / zerdûłe/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* زەردۆڵە؛ زەردەلە؛ ڕەنگ‌زەردی لاواز ☰ لاغرمُردنی

**زەردویی** / zerdûyî/: ناو. ١. ☜ **زەردەیی** ٢. بەلایەکی برنجەجاڕ ٣. زەردەی؛ جۆرێ مووروویی

بەودمە نەخۆشی زەردوویی‌دار هەڵیدەگرێ ☰ ١. ☜ **زەردەیی** ٢. نوعی آفت شالیزار ٣. نـوعی مُهـره برای دفع یرقان

**زەردە** / zerde/: ناو. ١. بزە؛ زەردەخەنە ٢. تیشکی تـاو لـە بـەیان و ئێـوارەدا ٣. جـۆرێ ماسـی ٤. هەڵوای گێزەر ☰ ١. تبسُّم ٢. پرتو آفتـاب بامـداد و غروب ٣. نوعی ماهی ۴. حلوای هویج

▣ **زەردەی خۆراوا**: زەردەپەڕ ☰ آفتاب دم غروب

**زەردەبرین** / zerdeb(i)rîn/: ناو. ئاورە؛ زەردەزەخم ☰ نوعی زخم واگیردار

**زەردەبی** / zerdebî/: ناو. زەربی؛ زەرەبی؛ جـۆرێ داربی ☰ نوعی بید

**زەردەبێ**[١] / zerdebê/: ناو. بـەهێی زەرد ☰ میوەی بە رسیده

**زەردەبێ**[٢]: ئاوەڵناو. *[کینایە]* زۆر زەرد ☰ زردِ زرد

**زەردەپەڕ** / zerdepeř/: ناو. ١. زەردەڵپەڕ؛ تیشکی نزیکی خۆراوا ٢. جۆرێ قەوزەی سـەر ئـاو ☰ ١. تابش آفتاب هنگام غروب ٢. نوعی خزەی روی آب

**زەردەتا** / zerdeta/: ناو. تای زەرد؛ نەخۆشـییەکی گرانی ڤایرووسییە، تـا و لـەرز و دڵ هەڵشـێوانی لەگەڵدایە، بە هۆی زیان دیتنی جەرگەوە پێست زەرد دەبێ ☰ تب زرد

**زەردەجوڕە** / zerdecuře/: ☜ **زەرباف**

**زەردەچۆ** / zerdeço/: ☜ **زەردەچێوە**

**زەردەچوو** / zerdeçû/: ☜ **زەردەچێوە**

**زەردەچەوە** / zerdeçewe/: ☜ **زەردەچێوە**

**زەردەچێـوە** / zerdeçêwe/: نـاو. زەردەچـــۆ؛ زەردەچـوو؛ زەردەچـەوە؛ وشـکەوەکراوی گیـای ڕەهازەر کە بۆ ڕەنـگ‌جـوانی و تـام و بۆنخۆشـی دەیکەنە نێو چێشتەوە ☰ زردچوبه

**زەردەخۆ** / zerdexo/: ☜ **زەردەخەنە**

**زەردەخەنـە** / zerdexene/: نـاو. زەردەخـــۆ؛ زەردەکەن؛ زەردەکەنە؛ زەردەکەنی؛ بزە ☰ تبسُّم

**زەردەدڕک** / zerded(i)řik/: ☜ **زەردەسیری**

**زەردەزوڕە** / zerdezuře/: ☜ **زەرباف**

**زەردەزەخم** / zerdezexm/: ☜ **زەردەبرین**

**زەردەزەردە** / zerdezerde/: نـاو. گولـــەهەنگوین؛ گیای سەفرابەر کە بۆ لابردنی زەرداو بەکەڵکە ☰ شاهسپرم کوهی

**زەردەزیـڕە** / zerdezîre/: نـاو. ١. ☜ **زەربـاف** ٢. زەردەواڵە؛ زەرگەتە ☰ ١. ☜ **زەربـاف** ٢. موسە؛ زنبور زرد

**زەردەزێـڕە** / zerdezêře/: ناو. پەریشارۆخ؛ مـەلێکی وردیلانەی سینگ زەردی باڵ ڕەشە ☰ زردەپرەی مزرعه

**زەردەســـــیری** / zerdesîrî/: نـــــاو. زەردەدڕک؛ دڕوەزەردە؛ زەدەسیری؛ گیایەکی دڕکاوی ڕەنگ زەردە، زۆرتـر لـە نێـو جـاڕ و دەیم و کێڵـگەدا دەڕوێ ☰ زردخار

**زەردەسێ‌پەڕی** / zerdesêpeřî/: ناو. گۆچانە بـاخی؛ شەوەرە سوورە؛ جۆرێـک شـەوەری عەترییـە ☰ یونجەی زرد

**زەردەشابەنگ** / zerdeşabeng/: ناو. بۆژانە؛ بۆماران ☰ بومادران

**زەردەشـــامی** / zerdeşamî/: نـــاو. گۆرەویلــــــە؛ گۆرەوی‌چنە؛ باڵندەیەکە هێلانەکەی بە شـێوەی گۆرەوی بە دارانداشۆڕ دەکاتەوە ☰ پرندەای است

**زەردەشتی** / zerdeştî/: ناو. زەرتوشتی؛ زەردەشتی: ١. ئـایینێکی دێـرین کـە بـە نـاوی زەردەشـت داهێنەرەکەیـەوە ناسـراوە و کتـێبی پیرۆزیـان ئاوێستایە ٢. گاور؛ گەور؛ هەر یەکە لـە پێـڕەوانی ئەو دینە ☰ ١و٢. زرتشتی

**زەردەقۆڕ** / zerdeqoř/: ناو. قۆڕیانەزەردە؛ قۆڕقـۆڕە ☰ آفتاب‌پرست

**زەردەقـــۆڕە** / zerdeqoře/: نـاو. زەردەقـــۆڕی؛ قووڕییەزەردە؛ جۆرێ مارمێلکەی ئەستوور و درێژ

▣ نوعی مارمولک

**زەردەقۆڕی / zerdeqořî/:** ☜ **زەردەقۆڕە**

**زەردەکەما / zerdekema/:** ناو. جۆرێ کەما ▣ نام گونەای کما

**زەردەکەن / zerdeken/:** ☜ **زەردەخەنە**

**زەردەکەنە / zerdekene/:** ☜ **زەردەخەنە**

**زەردەکەنی / zerdekenî/:** ☜ **زەردەخەنە**

**زەردەگوێنی / zerdeg(i)wênî/:** ناو. جۆرێک گەوەنە، ڕەنگی دڕک و لاسقەکەی مەیلەو زەردە ▣ نوعی گَوَن

**زەردەلۆ / zerdelo/:** ناو. لۆی زەردباو ▣ گیاهی است

**زەردەلوو / zerdelû/:** ☜ **زەردالی**

**زەردەلی / zerdelî/:** ☜ **زەردالی-١**

**زەردەڵ / zerdeł/:** ناوەلناو. زەردهەڵگەڕاو؛ ڕەنگپەڕیوی لەڕ و لاواز ▣ زردنبو

**زەردەڵپەڕ / zerdełpeř/:** ☜ **زەردەپەڕ-١**

**زەردەڵۆک / zerdełok/:** ناوەلناو. ١. مەیلەو زەرد؛ زەردەواشە ٢. زەردەڵ؛ کز و لاواز ▣ ١. مایل بە زرد ٢. زردنبو

**زەردەڵە[١] / zerdełe/:** ناو. میوەی لە بەر تاو وشکەوەکراو ▣ میوەی در آفتاب خشکیدە

**زەردەڵە[٢]:** ☜ **زەردوڵە**

**زەردەمار / zerdemar/:** ناو. جۆرە مارێکی ژەهرداره ▣ نوعی مار سمی

**زەردەماسی / zerdemasî/:** ناو. زنێر؛ سمبێلەک؛ ماسییەزەردە؛ جۆرێ ماسی زەردە لە ئاوی شیرینی چۆم و ڕووباران دەژی ▣ زرد ماهی

**زەردەواشە / zerdewaşe/:** ناوەلناو. زەردەڵۆک؛ مەیلەو زەرد ▣ مایل بە زرد

**زەردەواڵە / zerdewałe/:** ناو. ١. ☜ **زەرباف** ٢. ☜ **زەرگەتە**

**زەردەواڵەخۆر / zerdewałexor/:** ناو. ئەسپەشینە ▣ سبزقبا

**زەردەوان / zerdewan/:** ناو. شاخەوان؛ کەسێ کە بە شاخاندا هەڵدەچێ ▣ صخرەنورد

**زەردەوەرە / zerdewere/:** ☜ **زەرباف**

**زەردەوەلی / zerdewelî/:** ☜ **زەرباف**

**زەردەی / zerdey/:** ☜ **زەردویی-٣**

**زەردەیزڕە / zerdeyz(i)ře/:** ☜ **زەرباف**

**زەردەیی / zerdeyî/:** ناو. زەردی؛ زەردوویی؛ زەردیکە؛ زەردیوی؛ زەرکی؛ زەرەک؛ زەرۆکی؛ نەخۆشییەکی گیرۆیە، پێست و کاژ و سپێنەی چاو بە هۆی زۆر بوونی زەرداو لە خوێندا، زەرد دادەگەڕێن ▣ یرقان

**زەردهەڵگەڕاو / zerdhełgeřaw/:** ناوەلناو. *[کینایە]* زەردەڵ؛ ڕەنگپەڕیوی لەڕ و لاواز ▣ لاغرمُردنی

**زەردی / zerdî/:** ناو. ١. ☜ **زەردەیی** ٢. دۆخی زەرد بوون ‹زەردی ئەو سەردی هەوای پایزەن/ زەردی من سەردی مەیل ئازیزەن «مەولەوی»› ٣. قاقڵی؛ قاخڵی؛ کاجیرە ▣ ١. ☜ **زەردەیی** ٢. زردرنگی ٣. کافشە

**زەردیشامی / zerdîşamî/:** ناو. هەنجیرخۆرە؛ مەلێکی تیژفڕە لە تیرەی چۆلەکە ▣ پری شاهرخ

**زەردیکە / zerdîke/:** ☜ **زەردەیی**

**زەردینە / zerdîne/:** ناو. ١. ☜ **زەردێنە** ٢. *[مەجاز]* زێڕ و خشڵی ژنان ▣ ١. ☜ **زەردێنە** ٢. طلا و جواهرات زینتی

**زەردیوەرە / zerdîwere/:** ☜ **زەرباف**

**زەردیوەری / zerdîwerî/:** ☜ **زەرباف**

**زەردیوەلی / zerdîwelî/:** ☜ **زەرباف**

**زەردیوی / zerdîwî/:** ☜ **زەردەیی**

**زەردێلە / zerdêle/:** ☜ **زەرباف**

**زەردێنک / zerdênik/:** ☜ **زەردێنە**

**زەردێنە / zerdêne/:** ناو. زەردینە؛ زەردێنک؛ زەرک؛ زەرتک؛ زەردکی؛ ماکی ڕەنگ زەردی ناو

هێلکەی پەلەوەران 🇮🇷 زردەی تخم‌مرغ

**زەرزانیق / zerzanîq/**: ناو. هەلەق ـ مەلەق؛ جیندرحۆ 🇮🇷 الاکلنگ

**زەرزایی / zerzayî/**: ناو. هەڵوای ئاردەکونجی و دۆشاو 🇮🇷 نوعی حلوا

**زەرزوور / zerzûr/**: ناو. پەڕەسێلکە 🇮🇷 پرستو

**زەرزەپالی / zerzepalî/**: ئاوەڵناو. زەردهەڵگەڕاو لە بەر نەخۆشی 🇮🇷 زردرنگ از بیماری

**زەرزەنگ / zerzeng/**: ناو. ١. تاج ٢. تەزبی 🇮🇷 ١. تاج ٢. تسبیح

**زەرزەوات / zerzewat/**: ناو. سەوزی؛ سەوزیجات 🇮🇷 سبزیجات

**زەرسک / zersik/**: ناو. دارێکە تێخولەکەی بۆ دەرمان دەشێ 🇮🇷 درختی است

**زەرف / zerf/**: ناو. ١. دەفر ٢. پاکەت ٣. شیاوی؛ لێهاتوویی ‹زەرفی ئەم کارەی نییە› 🇮🇷 ١. ظرف ٢. پاکت ٣. ظرفیّت

**زەرفێن / zerfên/**: ناو. گەمەیەکە بە چەند فینجان دەکرێ 🇮🇷 نوعی بازی با فنجان

**زەرق / zerq/**: ناو. دووڕوویی؛ مەرایی 🇮🇷 تزویر

**زەرق‌وبەرق / zerq û berq/**: ناو. زریق و بریق؛ زریقه و بریقه: ١. زەڕ و زەنگیانە؛ مت‌ومورو؛ هەر چەشنە زێڕ و زێوی درۆیی و کەم‌بایەخ ٢. خشڵ؛ زێڕ و زەنبەر 🇮🇷 ١. زرق‌وبرق ٢. زخارف؛ زیورآلات

**زەرقی / zerqî/**: ناو. سەوز؛ سەبز؛ کەسک 🇮🇷 سبز

**زەرک / zerk/**: ناو. ١. زرک؛ تاسی مسی بچووک ٢. ☜ زەرتك ـ ٤ ٣. ☜ زەردێنە 🇮🇷 ١. طاس مسین ٢. ☜ زەرتك ـ ٤ ٣. ☜ زەردێنە

**زەرکەتاڤ / zerketav/**: ناو. تاوی زەردەپەڕ 🇮🇷 پرتو خورشید هنگام غروب

**زەرکەزەوی / zerkezewî/**: ناو. گیایەکە بە سەر زەویدا پان دەبێتەوە و سەلکی بنەکەی شیرینە 🇮🇷 گیاهی است

**زەرکی / zerkî/**: ☜ زەردەیی

**زەرگ / zerg/**: ناو. ١. شیشی دەروێشان ٢. خشت؛ دلام؛ ڕمب؛ کورتەنێزە؛ زووبین؛ ئامێری شەڕی کەونارا بە شێوەی ڕمی پچووکی نووک تیژ بە سەرێکی دووشاخەوە 🇮🇷 ١. سیخ دراویش ٢. زوبین

**زەرگاڵ / zergał/**: ناو. زەنگاڵ؛ ژەنگاڵ: ١. پێڵاوی لە موو چندراو ٢. گۆریەی تا بەر ئەژنۆ ٣. بەلەک‌پێچ 🇮🇷 ١. پاتابەی موین ٢. جوراب ساق بلند ٣. ساق‌پیچ

**زەرگۆز / zergoz/**: ☜ زڕگوێز

**زەرگە / zerge/**: ئاوەڵناو. [ڕلار] بڵندبالای باریک و قیت 🇮🇷 دراز و لاغراندام

**زەرگەتە / zergete/**: ناو. زەردەواڵە؛ زەنگەتە؛ زەرگیتە؛ زرکتک؛ زلکێنە: ١. مووز؛ ناوی گشتی خێزانی زەرگەتان لە ناسکبالان، بە لەشی خڕ و لووس، دەمێ بۆ هەڵلووشین و چز و باڵەوە، زۆربەیان گیاخۆرن و ژیانی بە کۆمەڵیان هەیە ٢. شاندەلیک؛ ستانگ؛ ستەنگ؛ گونجەزەردە؛ هەنگەژاڵە؛ گونجە زەرد؛ زلقتی؛ زڕقتک؛ زەردالگ؛ زیندەوارێکی چکۆلەی چزدارە پێوەدەدا 🇮🇷 ١. زنبور ٢. زنبور زرد

**زەرگیتە / zergîte/**: ☜ زەرگەتە

**زەرندە[١] / zerinde/**: ☜ زەرەند

**زەرندە[٢]**: ئاوەڵناو. خەتەر و مەترسیدار ‹بەراز جانەوەرێکی زەرندەیە› 🇮🇷 موذی و خطرناک

**زەرنوق / zernuq/**: ناو. زەرنوقاو؛ چەورایی کەم لە سەر ئاوی چێشت 🇮🇷 چربی کم بر روی آش

**زەرنوقاو / zernuqaw/**: ☜ زەرنوق

**زەرنووقایی / zernûqayî/**: ناو. تەواش؛ چەوری 🇮🇷 چربی

**زەروێڵە / zerwêle/**: ☜ زەرباف

**زەرۆپ / zerop/**: ئاوەڵناو. بەپا؛ خۆشڕەو 🇮🇷 تیزپا

**زەڕۆکی** / zerokî/: ☜ **زەردەیی**

**زەڕۆلە** / zerole/: ☜ **کەڵك ـ١**

**زەڕوو** / zerû/: ☜ **زارو ـ١**

**زەڕوور** / zerûr/: ئاوەڵناو. زەروری: ١. پێویست؛ پێداویست ٢. ناعیلاج؛ ناچار ☰ ١. لازم ٢. ناچار

**زەڕووری**[1] / zerûrî/: ناو. *[مەجاز]* ئاودەست؛ دەساو ☰ مُستراح

**زەڕووری**[2]: ☜ **زەڕوور**

**زەڕە** / zere/: ناو. ١. جۆرێ هەنجیر ٢. زەڕە؛ وردیلە؛ هەرە ورد ☰ ١. نوعی انجیر ٢. ذرّه

**زەڕەبی** / zerebî/: ☜ **زەردەبی**

**زەڕەج** / zerec/: ناو. زەڕەج؛ زەرەچ؛ زارنجە؛ کەو ☰ کبک

**زەڕەچ** / zereç/: ☜ **زەرەج**

**زەڕەد** / zered/: ☜ **زیان**

**زەڕەر** / zerer/: ☜ **زیان**

**زەڕەردەر** / zererder/: ☜ **زیاندەر**

**زەڕەقیانەوە** / zereqyanewe/: چاوگ. لە خۆشیاندا چیڕ بوونەوە ☰ از خوشحالی در پوست نگنجیدن

**زەڕەک** / zerek/: ناو. ١. ملوانکەی لە کارەبا ٢. ☜ **زەردەیی** ☰ ١. گردنبند کهربایی ٢. ☜ **زەردەیی**

**زەڕەکە** / zereke/: ناو. وێنجە ☰ یونجە

**زەڕەند** / zerend/: ناو. زەرەنگ؛ زەریوەن؛ زەرندە؛ زەرەندە؛ زەنندە؛ زرکەتاڵە؛ زرکەتاڵ؛ کاڵەکەمارانە؛ شوویتەمارانە؛ گوژاڵک؛ کوژاڵک؛ گووژەڵ؛ خەیاردێمی؛ شفتیتاڵک؛ گیایەکی وەک شووتی کە تاڵ و ژاراوییە و بۆ دەرمان ئەشێ ☰ هندوانەی ابوجهل

**زەڕەندە** / zerende/: ☜ **زەرەند**

**زەڕەنگ** / zereng/: ☜ **زەرەند**

**زەڕهەنجیر** / zerhencîr/: ناو. جۆرێ هەنجیر ☰ نوعی انجیر

**زەڕی**[1] / zerî/: ☜ **زەریا**

**زەڕی**[2]: ئاوەڵناو. ئەسمەر؛ سەوزە؛ سەوزەڵە؛ جوانی سپی پێستی هێندێک تاریک ☰ زیبای سبزەرو

**زەڕیا** / zerya/: ناو. زریا؛ زریە؛ زرێ؛ زەری؛ زێ؛ زەلیا؛ دەلیا؛ دەریا؛ کۆمەئاوی سوێری زۆر گەورە کە ڕێ دەباتە سەر ئاویتر و بە دەوریدا وشکانییە ☰ دریا

**زەڕیان** / zeryan/: ناو. کەیبانووی ماڵ ☰ کدبانو

**زەڕیایی** / zeryayî/: ئاوەڵناو. دەریایی: ١. پێوەندیدار یان سەر بە دەریاوە ٢. دەریاژی؛ خاوەن ژیان لە نێو دەریادا ☰ ١. دریایی ٢. دریازی

**زەڕیب** / zerîb/: ناو. دووئاوان؛ جێگەی تێکەڵاو بوونی دوو چۆم ☰ محل تلاقی دو رودخانه

**زەڕیف** / zerîf/: ئاوەڵناو. ١. دڵگر؛ دڵپەسند ٢. دەلال؛ جوان ‹ئەونە زەریفی لە حەد دەرچووگی/ ئاوێتەی گولەکان زەفەریە بووگی «فولکلۆر»› ☰ ١. دلپسند ٢. زیبا

**زەڕیق** / zerîq/: ناو. تیرۆژی سەر لە بەیان ☰ تابش بامدادی

**زەڕیقین** / zerîqîn/: چاوگ. درەوشینەوەی هەوەڵ تاوی بەیانی ☰ درخشیدن آفتاب بامدادی

**زەڕیک** / zerîk/: ئاوەڵناو. زراف ☰ باریک

**زەڕیکە** / zerîke/: ناو. گواتر؛ خەمبا ☰ گواتر

**زەڕیلە** / zerîle/: ☜ **زەرباف**

**زەڕیم** / zerîm/: ناو. نێرگز ☰ نرگس

**زەڕیوەن** / zerîwen/: ☜ **زەرەند**

**زەڕییم** / zeryîm/: ناو. نێرگز؛ نەرگز ☰ نرگس

**زەڕ**[1] / zeř/: ناو. ١. ☜ **زێڕ** ٢. ☜ **زیان**

**زەڕ**[2]: دەنگەناو. سەڕ؛ دەنگی بەرزی کەر ☰ عرعر الاغ

**زەڕئەوشان** / zeř'ewşan/: ناو. شاباش؛ شاواش؛ شاواز ☰ شاباش

**زەڕا**[1] / zeřa/: ناو. چرۆچاو؛ ڕەزا؛ دیدار ☰ سیما

**زەڕا**[2]: ئاوەڵکار. زەڕە؛ تۆسکاڵ؛ کەمووسکە ☰ ذرّە

**زەڕات** / zeřat/: ☜ **زوڕات**

**زەڕافە** / zeřafe/: ناو. وشترگا؛ هێشترگا؛ وشترپڵنگ؛ وشتربەڵەک؛ گیانەوەرێکی گوانداری ملدرێژە کە بەرزییەکەی، لە سمیەوە هەتا نووکی شاخی شەش میتر دەبێ و گەڵای دار دەخوا ☰ زرافه

**زەڕاندن** / zeřandin/: چاوگ. تێنەپەڕ. //زەڕاندت؛ دەزەڕێنی؛ بزەڕێنە// زەڕانن؛ سەڕانن؛ دەنگ هەڵبڕینی کەر ☰ عرعر کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەزەڕاندن

**زەڕانن** / zeřanin/: ☜ **زەڕاندن**

**زەڕبەنی** / zeřbenî/: ناو. کەسێ کە پارچەی زەڕی دە بەر دەکا ☰ زری‌پوش

**زەڕبیق** / zeřbîq/: ☜ **زەڕنیخ**

**زەڕتاڵ** / zeřtał/: ئاوەڵناو. گرانجان؛ خوێنتاڵ ☰ گرانجان

**زەڕتوشتی** / zeřtuştî/: ☜ **زەردەشتی**

**زەڕخڕی** / zeřx(i)řî/: ☜ **زەڕخڕید**

**زەڕخڕید** / zeřx(i)řîd/: ئاوەڵناو. زەڕخڕی؛ زێڕکڕ؛ کڕدراو ☰ زرخرید

**زەڕداڵ** / zeřdał/: ناو. سەندەڵ: ١. درەختێکی هیندی بە ڕەگ و ڕیشەی تاڵ‌تاڵ و گەڵای نووک‌تیژی بەرامبەر یەک و گوڵی بچووکی کۆمەڵ و هێشووی درێژ و دەنکی سەوزەوە کە بۆ دەرمانی نەخۆشی دڵ باشە ٢. چێوی ئەو دارە کە بۆنێکی توند و خۆشی هەیە و بەنرخە ☰ ١و٢. صندل

**زەڕدەشتی** / zeřdeştî/: ☜ **زەردەشتی**

**زەڕڕاقی** / zeřřaqî/: ئاوەڵناو. زۆر بەکەیف و ساز (نێرەکەر) ☰ سرحال (نرخر)

**زەڕڕە** / zeřře/: ناو. تۆزکاڵ؛ تۆزقاڵ؛ گەردیلە؛ هەندێکی یەکجار کەم ☰ ذرّە

**زەڕزوور** / zeřzûr/: ناو. پەڕەسیلکە؛ پەڕەسێلکە ☰ پرستو

**زەڕفاڕ** / zeřfař/: ناو. کەسێ کە پیشەی گۆڕینەوەی پارەی جۆربەجۆرە ☰ صرّاف

**زەڕق** / zeřq/: ناو. ترووسکە؛ بریقە ☰ درخشش

**زەڕقی** / zeřqî/: ئاوەڵناو. بەترووسکە ☰ درخشان

**زەڕقین** / zeřqîn/: چاوگ. ١. ترووسکە دان ٢. زۆپ بوون؛ هەڵماسین؛ هەڵتۆقین ☰ ١. درخشیدن ٢. برجسته شدن؛ برآمدن

**زەڕک** / zeřk/: ناو. کەمکۆڵ؛ تێکوڵە گوێزی شین ☰ پوستەی سبز گردو

**زەڕکفت** / zeřkift/: ☜ **زێڕکفت**

**زەڕکەش** / zeřkeş/: ئاوەڵناو. زێڕباف؛ زێڕدۆز؛ زێڕکار؛ بە زێڕ چنراو ☰ زرکش

**زەڕگۆز** / zeřgoz/: ناو. پەڵک؛ جۆرێ ڕەشەچنار ☰ درخت ترنگوت

**زەڕگووز** / zeřgûz/: ناو. گوێزە زەردە ☰ گردوی زال

**زەڕگەر** / zeřger/: ناو. زێڕینگەر ‹چ شیرین زەڕگەر تۆف هەوای سەرد/ گۆشوارە نە گۆش نەونەمامان کەرد «مەولەوی»› ☰ زرگر

**زەڕناس** / zeřnas/: ناو. ١. زێڕناس؛ کەسێ کە بە بەردی مەحەک زێڕ دەناسێتەوە ٢. *[کنایە]* مرۆڤی تێگەیشتوو ☰ ١. زرشناس ٢. آدم فهیم

**زەڕنەقووتە** / zeřneqûte/: ناو. ١. باڵابەرزە؛ قامکی قوونێ؛ تلیا ناڤی ٢. زڕنەقووتە؛ سوورەساقە ٣. *[مەجاز]* منداڵی کۆرپە ☰ ١. انگشت وسطی ٢. بچە گنجشک پر درنیاوردە ٣. نوزاد

**زەڕنیخ** / zeřnîx/: ناو. زەڕنیق؛ زەڕبیق؛ ماکێکی کیمیایی زەردە بە ناوی سولفیدی ئارسنیک ☰ زرنیخ

**زەڕنیق** / zeřnîq/: ☜ **زەڕنیخ**

**زەڕنیلە** / zeřnîle/: ناو. ڕیواس؛ ڕێواو ☰ ریواس

**زەڕوزەنگیانە** / zeř û zengyane/: ناو. مت‌وموورووو؛ هەر چەشنە زێڕ و زێو ئاسای مەراش و کەم‌بایەخ ≚ زلم‌زیمبو

**زەڕوەرەق** / zeřwereq/: ناو. کاغەزێکی پڕنەخش و نیگار یان ناسک و زیاتر ڕەنگین بۆ پێچانەوەی دیاری و پێشکەشی ≚ زرورق

**زەڕە**[١] / zeře/: ناو. ١. جوانی و لەباری؛ کۆی تایبەتمەندیگەلێ کە دەبێتە هۆی دڵپەسندی و دڵنشینی ٢. تۆزکاڵ؛ تۆزقاڵ؛ کەمترین ئەندازە ≚ ١. زیبایی ٢. ذرّە

**زەڕە**[٢]: دەنگەناو. سەڕە؛ دەنگی بەرزی کەر ≚ عر ـ عر؛ صدای الاغ

**زەڕەبین** / zeřebîn/: ناو. هوورک‌بین؛ ئامرازێک بۆ گەورە کردنەوە و باشتر دیتنی شتی زۆر ورد ≚ ذرّەبین

**زەڕەتاڵ** / zeřetał/: ناوەڵناو. ڕەزاتاڵ؛ ڕەزاگران ≚ زشت

**زەڕەج** / zeřec/: ☜ زەرەج

**زەڕەدار** / zeředar/: ناوەڵناو. لەبەردڵان؛ لەبار ≚ زیبا؛ خوشگل

**زەڕەزەڕ** / zeřezeř/: دەنگەناو. سەڕەسەڕ؛ زەڕەی لەپەستا ≚ عر ـ عر

**زەڕەشیرین** / zeřeşîrîn/: ناوەڵناو. ڕەزاشیرین؛ جوان ≚ زیبا

**زەڕەکەو** / zeřekew/: ☜ زرەکەو

**زەڕەگران** / zeřeg(i)ran/: ناوەڵناو. خوێنتاڵ؛ ڕەزاگران؛ ئێسک‌قورس ≚ گرانجان

**زەڕەوشان** / zeřewşan/: ناو. زێڕەوشان؛ کاری پارە بە سەر بووکدا هەڵخستنەوە ≚ زرافشان

**زەڕهەلی** / zeřhelî/: ناو. هەڵووچەزەردە ≚ آلوچەی زرد

**زەڕی** / zeřî/: ناو. پارچەی ڕایەڵ‌زێڕ ≚ پارچەی زری

**زەڕیان** / zeřyan/: ☜ زەڕین[١]

**زەڕیقین** / zeřîqîn/: چاوگ. درەوشان؛ دروشیان ≚ درخشیدن

**زەڕین**[١] / zeřîn/: چاوگ. زەڕیان؛ سەڕین؛ سەڕەسەڕ کردن ‹کلکی بەرزۆ کرد، لووتی هەڵبڕی/ بە دڵێکی خۆش جار ـ جار ئەزەڕی «قانع»› ≚ عر ـ عر کردن

**زەڕین**[٢]: ☜ زێڕین

**زەڕینگەر** / zeřînger/: ☜ زێڕینگەر

**زەعف** / ze'f/: ناوەڵناو. زاف؛ زۆر؛ فرە ≚ بسیار

**زەعفەران** / ze'feran/: ناو. زافران؛ زافەران: ١. گیایەکی ئاڵفی لە تیرەی زەمەقان بە شێوەی جۆراوجۆر، گۆشتن، بە گوڵی بنەوشی ئاڵ یان ئەرخەوانییەوە ٢. گەردەی ئەو گیایە بە بۆنی تیژ و تامی توندەوە کە بۆ جوان و بۆنخۆش کردنی خۆراک بە کار دێت ≚ ١و٢. زعفران

**زەعفەرانی** / ze'feranî/: ناوەڵناو. زافرانی؛ زافەرانی: ١. بە ڕەنگی زافەران ٢. بە تامی زەعفەران ≚ ١و٢. زعفرانی

**زەعیف** / ze'îf/: ناوەڵناو. زایف: ١. لاواز؛ کز؛ داڵگۆشت ٢. بێ‌تاقەت ≚ ١. لاغر ٢. ناتوان

**زەعیفە** / ze'îfe/: ناو. *[کنایە]* زایفە؛ ژن ≚ زن

**زەغ** / zeğ/: ناو. ↓

▣ **زەغ چوون**: نەمان؛ لە بەین چوون ≚ از بین رفتن

**زەغەل** / zeğel/: ناوەڵناو. بەدەل؛ ناڕەسەن ≚ نااصل؛ بدل

**زەغەڵ** / zeğeł/: ناوەڵناو. زەقەڵ؛ زەقەل؛ زرنگی فێڵباز ≚ دَغَل

**زەغەڵی** / zeğełî/: ناو. غەوش؛ خەوش؛ زەدە ≚ زدە؛ عیب

**زەفت** / zeft/: ناو. ١. ☜ زفت ٢. ☜ زەبت

**زەفتە** / zefte/: ☜ زفت

**زەفتیە** / zeft(i)ye/: ناو. پولیس؛ چەکداری فەرمی

ناوشار 🇬 پُلیس

**زەڤەر** / zefer/: ناو. زەڤەر؛ زالی ‹نالی بە ئومێدی زەفەری تەوقی تەلیسمت/ ماری سڕی زولفت لە سەر و گەردنی ئالا «نالی»› 🇬 ظفر

⊡ **زەڤەر پێ بردن**: دەرەقەت هاتن 🇬 غلبه یافتن

**زەڤلۆڤ** / zevlov/: ناو. ڕیخۆڵەی ئەستوور 🇬 رودەی بزرگ

**زەڤلەک** / zevlek/: ناو. ماسوولە؛ مایچە 🇬 عضله؛ ماهیچه

**زەڤۆک** / zevok/: ئاوەڵناو. زەوک؛ تایبەتمەندی ژنێ کە زۆر دەزێ 🇬 زایا؛ بسیار زا

**زەڤەر**[1] / zever/: ☜ زەفەر

**زەڤەر**[2]: ئاوەڵناو. چالاک؛ گورج و گۆڵ 🇬 چابُک

**زەڤەنگ** / zeveng/: ناو. زەوەنگ؛ داخوازی 🇬 درخواست

**زەڤی** / zevî/: ☜ زەوی

**زەڤیانە** / zevyane/: ناو. باجی زەوی 🇬 مالیات زمین زراعتی

**زەڤیپیڤ** / zevîpîv/: ☜ زەویپێو

**زەڤێر**[1] / zevêr/: ناو. ئارەزووی نزیکی (سێکس) 🇬 هوس جِماع

**زەڤێر**[2]: ئاوەڵناو. زوور؛ زوویر 🇬 ناخشنود

**زەق**[1] / zeq/: ناو. زق: ۱. زوقم؛ سیخوار؛ خوێز ۲. سەرما و بەستەڵەک ۳. کەڵلا؛ هەڵمات 🇬 ۱. سرماریزه ۲. سرما و یخبندان ۳. تیله

**زەق**[2]: ئاوەڵناو. زق؛ زوک؛ زۆق؛ قوت 🇬 برجسته؛ نمایان

**زەقانن** / zeqanin/: چاوگ. وە پێکەنین هێنانی منال 🇬 خنداندن بچه

**زەقاو** / zeqaw/: ☜ زقاو

**زەقایی** / zeqayî/: ☜ زەقی

**زەقت** / zeqt/: ناو. نەقیزە 🇬 سیخونک

**زەقتواشا** / zeqt(i)waşa/: ئاوەڵناو. چاوزەق؛ چاودەرپەڕیو 🇬 چشم برجسته

**زەقزەقە** / zeqzeqe/: ناو. ئەستێرە 🇬 ستاره

**زەقنە** / zeqne/: ئاوەڵناو. ژەقنە؛ هەرەتاڵ؛ زۆرتاڵ 🇬 بسیار تلخ

**زەقنەبوت** / zeqnebût/: ☜ ژەقنەموت

**زەقنەبیت** / zeqnebît/: ☜ ژەقنەموت

**زەقنە پوت** / zeqnepût/: ☜ ژەقنەموت

**زەقنەموت** / zeqnemût/: ☜ ژەقنەموت

**زەقە** / zeqe/: ناو. زاقە؛ چاوی لێک نەندراو ‹هەر زەقەی چاوی دێ› 🇬 چشم وا گشوده

**زەقەزەق**[1] / zeqezeq/: ناو. کاری چاو داپچڕین و چاو لێ دانەخستن 🇬 عمل زُل زدن

**زەقەزەق**[2]: دەنگەناو. دەنگی قاڵ و قیژی بە خۆشییەوە 🇬 هورا

⊡ **زەقەزەق کردن**: خۆشی دەربڕین بە دەنگی بەرز و بە قاڵ و قیژ 🇬 هورا کشیدن

**زەقەل** / zeqel/: ☜ زەغەڵ

**زەقەڵ** / zeqeł/: ☜ زەغەڵ

**زەقەڵتە** / zeqełte/: ناو. ژار؛ زەهر؛ ژەهر 🇬 زهر

**زەقی** / zeqî/: ناو. زەقایی؛ قۆقزایی؛ پزۆپی؛ دەرپەڕیوی 🇬 برآمدگی

**زەقین** / zeqîn/: چاوگ. تریقانەوەی منال 🇬 قهقه زدن کودک

**زەک** / zek/: ئاوەڵناو. زەق؛ زۆپ 🇬 برجسته؛ برآمده

**زەکات** / zekat/: ناو. *[شەرع]* هەندی دیاریکراو لە ماڵی موسڵمان (واتە: مانگا، پەز، وشتر، گەنم، جۆ، خورما و مێوژ، زێڕ یان زیو) کە دەبێ دەری کا و بیداتە ئەوانەی پێیان دەگا 🇬 زکات

⊡ **زەکات دەرکردن**: جیا کردنەوەی بەشێ لە دارایی بەپێی فەرمانی شەرع و بەخشینی بەوانەی پێیان دەگا، لە ڕای خودا 🇬 زکات دادن

**زەکەت** / zeket/: ناو. وێنجە 🇬 یونجه

**زەگر** / zegr/: ناو. زغرگ؛ وردەبەرد 🇬 خُردەسنگ

**زەگزەگـە** / zegzege/: ناوەڵـناو. [پـلار] زەگـــوردە؛ زەگەردوگ؛ زەبەلاح؛ زلحۆ؛ زلحۆرت ☰ لندهور

**زەگوردە** / zegurde/: ☜ **زەگزەگە**

**زەگەردوگ** / zegerdug/: ☜ **زەگزەگە**

**زەل**[۱] / zel/: نـاو. ۱. قـامیش؛ چیتـغ؛ چیتـک ۲. گیایەکی سێ سووچە لە باتلاغ دەڕوێ ۳. باتلاغ؛ هەردی تەڕی شل ٤. شوێنی خز و خلیسـک ☰ ۱. نی ۲. گیاهی باتلاقی ۳. باتلاق ۴. لیزگاه

⊡ **کردنە زەل**: [کینایە] تەفروتوونا خسـتن؛ لـە نـاو بـردن ‹نایـدەی بـە تـوون، خـوا ئـەیکردە زەل›.

هەروەها: **بوونە زەل** ☰ بر باد فنا دادن

**زەل**[۲]: ئاوەڵناو. خز ☰ لیز

**زەلام**[۱] / zelam/: ناو. زلام؛ کەس؛ کـێس؛ یەکـەی بـژاردنی مـرۆ ‹دوو زەلام هـاتبوون نەمناسـین› ☰ شخص؛ کَس

**زەلام**[۲]: ئاوەڵـناو. زلام: ۱. گـەپ؛ زل ۲. نۆکـەر ۳. بێناو؛ بێناو و نیشان ☰ ۱. گُنده ۲. نوکر ۳. بی‌نام و نشان

**زەلامبـــاش** / zelambaş/: ئاوەڵـــناو. [پـــلار] ۱. ســەرگەورە؛ کەڵلـەزل؛ بـە هێـز و کارتێکـەری کۆمەڵاتییەوە ۲. زەبەلاح؛ گەلحۆ زلحـۆرت ☰ ۱. کلەگُنده ۲. لندهور

**زەلامۆک** / zelamok/: ناو. پیاویژگە؛ پیاوی خوێڕی ☰ بیکاره

**زەلامەڕێ** / zelameřê/: نـاو. پیـادەڕێ؛ ڕێگەیـەک کە سوار نەتوانێ پێدا بڕوا ☰ پیادەرو

**زەلامی** / zelamî/: نـاو. [پـلار] زلی؛ گـــەورەیی ☰ گُندگی

**زەلان**[۱] / zelan/: چـاوگ. ۱. خلیسکان؛ خزیـان ۲. [کینایە] لە ڕێگە کلا بوون ☰ ۱. لیز خـوردن ۲. از راه منحرف شدن

**زەلان**[۲]: ☜ **زریان**

**زەلانـدن** / zelandin/: چـاوگ. ۱. خلیســکاندن؛ خزاندن ۲. [کینایە] لـە ڕێ دەرکـردن ۳. [کینایە] زگ لەوەڕانــدن ☰ ۱. لیـز دادن ۲. از راه منحـرف کردن ۳. شکم چراندن

**زەلاندنەوە** / zeland(i)newe/: چاوگ. میـوان بـۆ ماڵی خەڵک ناردن ☰ مهمان بـر دیگـران تحمیـل کردن

**زەلانەوە** / zelanewe/: چاوگ. زەلینـەوە؛ خـۆ بـە سەر خەڵکا سەپاندن بـۆ خـواردن و نووسـتن ☰ خورد و خواب خود را بر دیگران تحمیل کردن

**زەلجاڕ** / zelcař/: ناو. ژاژەلان؛ قامیشەلان ☰ نیزار

**زەلزەلـــۆک** / zelzelok/: نـــاو. خلیســـــــکێن؛ خزخزەکانێ ☰ سُرسُرەبازی

**زەلـزەلـە** / zelzele/: نـاو. بوولـەرە؛ بوومەلـەرزە ☰ زلزله

**زەلق** / zelq/: ناو. ڕەوتی لکان؛ چەسپین ☰ اتصال

**زەلقانـــدن** / zelqandin/: چـــاوگ. زەلیقانـــدن؛ لکاندن؛ لکانن؛ چەسپانن ☰ چسباندن

**زەلقیـان** / zeliqyan/: چـاوگ. نووسـان؛ لکیـان؛ لکان؛ چەسپان؛ چەسپیان ☰ چسبیدن

**زەلـک** / zelk/: نـاو. ۱. ☜ **زراو**[۱]**ـــ۱** ۲. لاسـکە گیای باریکی وشک ☰ ۱. ☜ **زراو**[۱]**ـ۱** ۲. ساقەی باریک و خشک گیاه

**زەلکاو** / zelkaw/: نـاو. زەلکـە؛ زەلکـۆ؛ چـارچیق؛ زۆنگ؛ قۆپی؛ باتلاخ؛ باتلاغ ☰ باتلاق

**زەلکۆ** / zelko/: نـاو. زەردکـاو؛ قـۆپی؛ بـاتلاغ و قامیشەڵێن ☰ نیزار باتلاقی

**زەلکە** / zelke/: ناو. ۱. ☜ **زەلکاو** ۲. [کینایە، پلار] شۆربای ڕوون و بێتـام ☰ ۱. ☜ **زەلکـاو** ۲. آش زیپو

**زەللە** / zelle/: ناو. دۆخی جۆریان؛ زمان بە هەڵـە گەڕان ☰ تُپُق

**زەل‌وتـووڵ** / zel û tûł/: نـاو. هــەلاش؛ زەڵـــمە؛ چرپی‌وچاڵی بانەڕا ☰ انبیره؛ شاخ و برگـی کـە بـر

سقف اندازند

**زەڵ‌ومۆر** / zel û mor/: ناو. مەڕ و ماڵات ▣ احشام

**زەڵو** / zelû/: ☜ **زارو ـ١**

**زەڵووت** / zelût/: ئاوەڵناو. ١. تاس؛ بێ‌موو ٢. ڕووت و قووت ▣ ١. بی‌مو؛ تاس ٢. لُخت و عور

**زەڵووتی** / zelûtî/: ناو. قووتی؛ ڕووتی؛ پەتییەتی ▣ برهنگی

**زەڵە** / zele/: ناو. ١. ☜ **زراو[١]ـ١** ٢. زللە؛ شەقام؛ شـەق؛ شـەقەزلە ٣. ژاڵـە؛ لـووڕک ▣ ١. ☜ **زراو[١]ـ١** ٢. سیلی ٣. خرزهره

**زەڵەرەتە** / zelerete/: ئاوەڵناو. زەڵـەقات؛ زراوچـوو ▣ زَهره‌ترک

**زەڵەقات** / zeleqat/: ☜ **زەڵەرەتە**

**زەڵەقوون** / zeleqûn/: نـاو. زلاقوونـک؛ زلبەقوونـە؛ زل‌بەقنگە؛ زەڵـەقوونک؛ زەڵـەقوونگ؛ دومدیکـە؛ پـووش‌بەقوونـە؛ چوکڵـەقنگە؛ زەڵـەقوونگ؛ چوکڵـەعنە؛ مێروویـەکی فڕندەیـە بـە لەشـی پستەیی کاڵ، چاوی زل و زەق، دوو باڵی ناسکی جـوان و ڕەنگامـە و سـکی باریـک و درێـژەوە، پێگەیشتووەکانیان ڕاوچی و تیژفڕن و لە سەر ئاو یان بە سـەر گیـای ئاوژییـەوە گـەرا دەکـەن ▣ سنجاقک

**زەڵەقوونک** / zeleqûnik/: ☜ **زەڵەقوون**

**زەڵەقوونگ** / zeleqûnig/: ☜ **زەڵەقوون**

**زەڵهـان** / zelhan/: چـاوگ. خـزین؛ خوشـین ▣ خزیدن

**زەڵیا** / zelya/: ☜ **زەریا**

**زەڵیقاندن** / zelîqandin/: ☜ **زەڵقاندن**

**زەڵیل** / zelîl/: ئاوەڵناو. ١. زۆر نەخۆش؛ لەش‌بـەبار ٢. بێچارە و لێ‌قەوماو ‹ناکەن هەوایی هیچ کـەبابێ زەڵیلی شەهر/ بوریانە بـەس لـە نـاری غـەما پـارەیی جگەر «سالم»› ٣. سووک؛ پەست؛ بێ‌ڕێز و بایەخ ‹لە شارەکەت زەڵیلە شێر، باوی ڕێوییە «سوارە»› ▣ ١. سخت بیمار ٢. بیچاره؛ بینوا ٣. خوار و ذلیل

**زەڵین** / zelîn/: چاوگ. ١. خلیسـکان؛ خزیـان ٢. خووسـان؛ تلیسـان ▣ ١. لغزیـدن؛ لیـز خـوردن ٢. خیس شدن

**زەڵینەوە** / zelînewe/: ☜ **زەڵانەوە**

**زەڵیو** / zelîw/: نـاو. زەوینی زۆر خووساو بە بـاران کە لاقی تێ هەڵدەچەقێ ▣ زمین گلی

**زەڵێن** / zelên/: ناو. زەناو؛ زەوینی زۆنگ و مەکۆی شین بووی قامیش و زەل ▣ زمین باتلاقی

**زەڵاتـە** / zełate/: نـاو. سلـپاتە؛ ئاوێتەیـەک لـە سەوزی، تەماتە، خەیار و گۆشـت یـان هێلکـەی ئەنجراو و دانەوێڵە و سماق و ... کە بە ساردی و وێڕای خواردەمەنی‌تر دەخورێ ▣ نوعی سالاد

**زەڵاڵ** / zełał/: ☜ **زوڵاڵ**

**زەڵزەڵە** / zełzełe/: نـاو. ١. زنچکاو؛ ئاوی برین ٢. کلۆی نەخووس لە نێو قـوڕدا ▣ ١. آب روی زخـم ٢. کلوخ خُشک در گل

**زەڵگ** / zełg/: ☜ **زراو[١]ـ١**

**زەڵم** / zełm/: نـاو. ئاوی لێڵی توێژ لە سـەر ▣ آب کدر لایه گرفته

**زەڵمە** / zełme/: ناو. ١. گیایەکی لاسـک درێـژی بێ‌وەچ و گەڵا، بە گوڵی زەردبـاوی وردـ وردەوە لـە مێـرگ و قـەراخ چۆمـان دەڕوێ ٢. ☜ **زەڵ‌وتووڵ** ▣ ١. گیاهی است ٢. ☜ **زەڵ‌وتووڵ**

**زەڵە** / zełe/: ☜ **زڵە**

**زەڵەزەڵ** / zełezeł/: ☜ **زڵەزڵ**

**زەڵەویان** / zełewyan/: چاوگ. شێوان؛ پەرێشـان بوون ▣ آشفتن

**زەم** / zem/: ناو. فڕ؛ کاری خراپە وتن ▣ ذَم؛ هَجو

**زەما** / zema/: نـاو. ١. ☜ **زاوا** ٢. سـەما؛ ڕەقـس ▣ ١. ☜ **زاوا** ٢. پایکوبی

**زەماخوا** / zemax(i)wa/: نـاو. شیرنی زاوایـەتی ▣ شیرینی دامادی

**زەمان / zeman/:** ناو. ١. وەختان؛ دەمان ٢. ڕۆژگار؛ زەمانە ☰ ١. زمان ٢. زمانە

**زەمانە / zemane/:** ناو. ڕۆژگار ☰ روزگار

**زەماوند / zemawind/:** ☜ **زەماوەند**

**زەماوننە / zemawinne/:** ☜ **زەماوەند**

**زەماوەن / zemawen/:** ☜ **زەماوەند**

**زەماوەند / zemawend/:** ناو. زەماوەن؛ زەماوەنگ؛ زەماوەنە؛ زەماوند؛ زەماوننە: ١. سوور؛ گۆڤەند؛ هەڤالا؛ شادیانە؛ داوەت؛ دۆوات؛ دەوەت؛ تۆی؛ شاهی؛ شایی؛ بەزم؛ ڕێوڕەسمێ کە بە بۆنەی یەک گرتنی ژن و پیاوێک بەڕێوە دەچێ و وێڕای بەزم و هەڵپەڕکێیە ٢. دۆخی جووت بوون ‹زەماوەند سەگ و گورگ شیوەن شوانە «مەسەل»› ☰ ١. عروسی ٢. وضعیّت جُفت شدن

⊡ **زەماوەند کردن:** هاوسەر گرتن؛ ژن هێنان یان شوو کردن ☰ عروسی کردن

**زەماوەند گرتن:** داوەتی گرتن؛ شایی گرتن؛ شایی گێڕان؛ ئاهەنگ گرتن بە بۆنەی زەماوەندەوە ☰ عروسی گرفتن

**زەماوەنگ / zemaweng/:** ☜ **زەماوەند**

**زەماوەننە / zemawenne/:** ☜ **زەماوەند**

**زەماوەنە / zemawene/:** ☜ **زەماوەند**

**زەمبلە / zemb(i)le/:** ☜ **چلوورە-١**

**زەمبوورە / zembûre/:** ناو. زەمووورەک؛ زەنبوورە؛ کونی تەنگی بن دۆلاش ☰ سوراخ تنگ ناو آسیا

**زەمبوول / zembûl/:** ناو. زەنگاڵ؛ تلسک؛ تیسک؛ هێشووە چکۆلە لە هێشوو ☰ تلسک

**زەمبە / zembe/:** ناو. ناوە؛ ئەستەموولی؛ ئەسەموولی؛ جۆرێ دەفری گەورەی دەم والا بۆ کاری بەنایی ☰ زنبە؛ استانبولی

**زەمبەر / zember/:** ناو. ١. زەنبەر؛ خشڵ؛ ڕەوش ٢. چین؛ ڕادە (لێ دان) ‹دەبێ زەمبەرێک لێی دەم!› ☰ ١. زیور ٢. فصل (کتک‌کاری)

**زەمبەرەک / zemberek/:** ناو. زەمبەلەک؛ زەنبەرەک؛ زەنبەلەک؛ فەنەری سەعات ☰ زنبرک؛ فنر ساعت

**زەمبەریش / zemberîş/:** ناو. سەرین ☰ بالش

**زەمبەق / zembeq/:** ☜ **زەمەق**

**زەمبەلەک / zembelek/:** ☜ **زەمبەرەك**

**زەمبەلیک / zembelîk/:** ناو. شوس‌یەخ؛ چلوورە ☰ دنگالە

**زەمبەلیلک / zembelîlik/:** ☜ **چلوورە-١**

**زەمبیل / zembîl/:** ☜ **زەمیلە**

**زەمبیلۆکە / zembîloke/:** ناو. قەرتاڵەی چکۆلە ☰ سبد کوچک

**زەمبیلە / zembîle/:** ☜ **زەمیلە**

**زەمتاندن / zemtandin/:** چاوگ. ١. ڕووتاندنەوە؛ پەڕوپۆ لێ کردنەوە ٢. ڕاوەستاندن (خوێن و ...) ☰ ١. پر کَندن ٢. بند آوردن (خونریزی و ...)

**زەمتە / zemte/:** ناوەڵناو. تێکسمڕاوی تەمەڵ ☰ یُغور تنبل

**زەمتین / zemtîn/:** چاوگ. ١. ئاوەڕووت کردن ٢. وێستانەوە (خوێن و...) ☰ ١. پَر کندن ٢. بند آمدن (خونریزی و ...)

**زەمر / zemr/:** ناوەڵناو. ١. ڕەشەمەس؛ زۆر مەست؛ مەستی شەشدانگ ٢. تەمەڵ؛ تەوەزەل ☰ ١. پاتیل؛ سیاەمست ٢. تنبل

**زەممە / zemme/:** ناو. زەمە؛ زمبەر؛ ناوە؛ دەفری قوڕ پێ‌کێشان کە بە دوو کەس هەڵدەگیرێ ☰ زنبە؛ ناوەی دو نفرەی گِل‌کشی

**زەمۆمە / zemome/:** ناو. تیغە؛ مابەین: ١. کاری نێوان کردنی شوێنێک بە قوڕ یان بە تەمان ٢. دیوارۆکەی تایبەت بۆ ئەو کارە ☰ ١و٢. تیغە

**زەموورەک / zemûrek/:** ☜ **زەمبوورە**

**زەمە / zeme/:** ☜ **زەممە**

**زەمەر[١] / zemer/:** ناو. ١. خێشک ٢. گەزن؛ زەرەر؛

زیـان. هـەروەها: زەمـەر (لـێ) دان ☚ ١. مالـەی شخم صاف‌کن ٢. ضرر

**زەمەر**[٢]: ئاوەڵناو. وێـران؛ تێـک‌تـەپاو؛ داڕووخـاو ☚ ویران

**زەمەق** / zemeq/: نـاو. زەمبەق؛ زیوا: ١. گیایـەکی ڕازێنەیی، بـە لاسـکی قیـت و گـەڵای کەسـکی تۆخی خەنجەرئاسـا و گولـی چەنـد جـۆرەوە ٢. گوڵی ئەو گیایە کە گەورە و سپی، وەنەوش یـان زەردی بۆنخۆشە و چەنـد جـۆری هەیـە ☚ ١و٢. زنبق

**زەمەگلێرە** / zemeg(i)lêre/: ☜ **زەنبەلوولە**

**زەمەگولیلک** / zemegulîlik/: ☜ **زوقم-١**

**زەمەن** / zemen/: نـاو. ١. گەردەلوول؛ گێژەڵـووکە ٢. زەمەند؛ بژوێن؛ دەشت و زەمینی پـڕ گیـا ٣. کات؛ وەخت ☚ ١. گردباد ٢. مرغزار ٣. زمان

**زەمەند** / zemend/: ☜ **زەمەن-٢**

**زەمهەریر** / zemherîr/: ☜ **زمهەریر**

**زەمیل** / zemîl/: نـاو. خانـک؛ زەنبیلـە؛ سـەلە ☚ زنبیل

**زەمیلە** / zemîle/: نـاو. زلینـە؛ زەمبیـل؛ زەمبیلـە؛ زەنبیـل؛ زەنبیلـە؛ دەسـکلە؛ چنگلـە؛ خانـک؛ گۆشـەر؛ قەوشـەر؛ قەوچـەر؛ تلـۆخ؛ بەرچینـە؛ دەسەچینە؛ کەتلە؛ دەفرێکـی نـەرمی چنـراو لـە لاسکە گیا، نایلۆن یان سیم، بە دەستەی درێژەوە کە بـۆ هەڵـگرتن و جێبـەجێ کـردنی کەلپـەل بەتایبەت لە کاتی کڕیندا بە کار دەچێ ☚ زنبیل

**زەمین** / zemîn/: ☜ **زەوی**

**زەمینگیر** / zemîngîr/: ئاوەڵناو. زەوینگیر؛ لێکەوتە؛ لێکەفتگ؛ ناکارا لە جمشـت، بەتایبـەت لـە بـەر نەخۆشی یان کزی ‹وەها زەمینگیر بوونـە، فزەیـان لێ نایە› ☚ زمینگیر

**زەمینلـەرزە** / zemînlerze/: نـاو. بوومەلـــەرزە؛ زەلزەلە ☚ زلزلە

**زەمینی** / zemînî/: ☜ **زەوینی**

**زەن**[١] / zen/: ☜ **زنە**[١]

**زەن**[٢]: ☜ **زیندوو**[٢]

**زەنا** / zena/: ناو. هەرا؛ چەقە ☚ فریاد؛ غوغا

**زەنا ـ زەنا** / zena zena/: ناو. زنـا ـ زنـا؛ چەقـە و گوڕەی زۆر ☚ همهمه؛ جنجال

**زەناو** / zenaw/: ☜ **زلێن**

**زەنبوورە** / zenbûre/: ☜ **زەمبورە**

**زەنبەر** / zenber/: ☜ **زەمبەر-١**

**زەنبەرەک** / zenberek/: ☜ **زەمبەرەك**

**زەنبەلوولـە** / zenbelûle/: نـــاو. زەنبەلوویلـــــە؛ زەمەگلێرە؛ چلوورە ☚ دنگاله

**زەنبەلوویلە** / zenbelûyle/: ☜ **زەنبەلوولە**

**زەنبەلەک** / zenbelek/: ☜ **زەمبەرەك**

**زەنبیل** / zenbîl/: ☜ **زەمیلە**

**زەنبیلە** / zenbîle/: ☜ **زەمیلە**

**زەنج** / zenc/: ناو. ١. ☜ **زەنی** ٢. زنە؛ زۆنـگ ☚ ١. ☜ **زەنی** ٢. باتلاق

**زەنجەف** / zencef/: نـاو. مت‌ومـووروو؛ زێـڕ و زیـو؛ خشڵ و خاو ☚ زر و زیور

**زەنجەفیل** / zencefîl/: ☜ **زەنجەفێڵ**

**زەنجـەفێڵ** / zencefêł/: نـاو. زەنجـەفیل؛ هەڵـەزە؛ گیایێکی ئالفی کـە بنەکـەی وشـک دەکەنـەوە، گەرم و توندە و بۆ بەهارات دەبێ ☚ زنجبیل

**زەنجیر** / zencîr/: ☜ **زنجیر**

**زەنخ** / zenx/: ئاوەڵناو. گەنیو؛ گەنیگ ☚ گندیده

**زەند**[١] / zend/: ناو. ١. نێوان جومگە و ئانیشـک ٢. *[مەجاز]* برە دار؛ کوتە چێو ☚ ١. زند؛ ساعد ٢. قطعه هیزم

**زەند**[٢]: ئاوەڵناو. مەزن؛ گەورە ☚ بزرگ

**زەندانە** / zendane/: ناو. زرێی باسک‌پـۆش ☚ زره بازوی جنگجو

**زەندشـۆڕ** / zendşoř/: نـاو. زەندەشـــۆڕ؛ جـــۆرە

سەگێکە چوارپەلی تا قولاپە و تا مەچەک لە سەر زەوی دادەنێ ☰ نوعی سگ

**زەندک / zendik/**: ناو. جومگـەی دەسـت ☰ مُـچ دست

**زەندۆر / zendor/**: ☜ **زەندۆڵ**

**زەندۆڵ / zendoł/**: ناو. زەندۆر: ١. ڕەهۆڵ؛ قەڵشی زل لە زەویدا ‹کوندی شـوومی شـەڕ لـە زەنـدۆلان خزی بە دزی و فزی/ کۆتری سولح و ئاشتی نیشتووە لە سەر دیواری کورد «هێمن»› ٢. شیوەڵەی تەنگ ☰ ١. شکاف بزرگ در زمین ٢. درّەی تنگ

**زەندووک / zendûk/**: ناو. قۆڵـچاخ؛ مەچـەک‌پـێچ؛ پارچەی باسک‌پـۆش، وەک سـۆرانی، بـۆ کـار ☰ ساعدپوش هنگام کار

**زەندەشۆڕ / zendeşoř/**: ☜ **زەندشۆڕ**

**زەندەق / zendeq/**: ناو. زەندەک؛ زەنـەق: ١. ورە؛ هێزی دڵ ٢. زراو ☰ ١. قوّت قلب ٢. زَهره

▣ **زەندەق چوون**: ورە بـەردان؛ هـەترەش چـوون؛ زارەترەک بوون ‹بوومە گەپچار و دەکا گاڵتەی بە مـن/ ئـەو ڕمووزنـەی زەنـدەقی چووبـوو لـە مـن «هێمن»› ☰ زَهره‌ترک شدن

**زەندەقبەر / zendeqber/**: ناوەڵناو. تـرس‌هێنـەر؛ ترسێنەر؛ زاتبەر ☰ ترس‌آور؛ ترساننده

**زەندەک / zendek/**: ناو. ١. پارچەی باسک‌پۆش بۆ کار ٢. ☜ **زەندەق** ☰ ١. ساعدپوش هنگام کـار ٢. ☜ **زەندەق**

**زەنگ**[١] **/ zeng/**: نـاو. ١. زەنگۆڵـە؛ زەنگـڵ؛ زیـل؛ ئامێرێ بۆ سەرنج ڕاکێشان یان وشـیاری دان بـە شێوەی: *الف)* کەرەستەیەکی کانزایی نـاو هـۆڵ کە گۆیەکی لە ناودایە و لە لەرانـەوەدا دەنگێکـی زایەڵـەداری لـێ دێ *ب)* پەڕەیـەکی کـانزایی هەڵواسراو کە بە هـۆی کوتـانی بـە چەکوچـەوە دەنگێکی زایەڵەداری لێـوە دەردێ *ج)* دەزگایـێ ئیلکترۆمیغناتیسی، بریتی لە پەڕەیەکی کانزایی و میغناتیسێکی نزیـک بـە یـەک کـە بـە لێـدانی دوگمەیەک، کارەبا لـە ناوەنـدی میغناتیسـەکەدا وەگـەڕ دەکـەوێ و ڕادانی لـە پەسـتای پـەڕەی کانزایی دەبێتە هۆی بـەرز بوونـەوەی دەنگێکـی وشـیارکەرەوەی زایەڵـەدار *د)* دەزگـایێکی ئیلکترونیکی کە بە لێدانی دوگمـەیێ کارەبـای تێـدا وەگـەڕ دەکـەوێ و دەبێتـە هـۆی بـڵاو بوونەوەی دەنگ یان ئاهەنگێکی تایبەت ٢. ڕۆنی داغ ٣. ڕکێـف؛ ئـاوزەنگی؛ وزەنگـی؛ مەنـەک ٤. قەڵـش؛ درز ٥. ☜ **ژەنـگ** ٦. ئیزنـگ؛ داری سووتان ٧. کـاری زیراندنـەوەی زەنگـی درگـا و تەلـەیفون ٨. کـاتی دیـاریکراو بـۆ دەرس لـە قوتابخانە ☰ ١. زنگ؛ جرس؛ درای ٢. روغـن داغ ٣. رکـاب ۴. درز؛ تـرک ۵. ☜ **ژەنـگ ۶** هیـزُم ٧و ٨ زنگ

▣ **زەنگی وچان**: کاتی پشـوودان؛ مـاوەی کـورتی دوای کەرتێکی وانە کە قوتابیـان دەتـوانن لـە پۆل بچنە دەرەوە و پشوویەک بـدەن ☰ زنـگ تفریح

▣ **زەنگ بردن**: ١. درز بردن؛ قەڵشـین ٢. *[مەجاز]* قەڵەشان؛ داخی زۆر چوونە دڵـەوە ☰ ١. تـرک بردن ٢. سخت حسرت خوردن

**زەنگ دان**: ☜ **زەنگ لێدان**

**زەنگ زریان**: ١. دەنـگ لـە زەنگۆڵـە هـاتن ٢. *[کینایی]* ئابڕوو چـوون ☰ ١. صـدا دادن زنـگ ٢. رسوا شدن

**زەنگ لێدان**: زەنگ دان: ١. دەنگ لـە زەنگـەوە دەرهێنان ‹زەنگی دەرگاکەیان لێ دا› ٢. *[کینایە]* تەلەفوون کردن ☰ ١. زنگ را به صـدا در آوردن ٢. تلفن کردن

**زەنگ**[٢]: پێرۆ. ← **زەبروزەنگ**

**زەنگارۆ**[١] **/ zengaro/**: ناو. ڕەنگی شین ☰ رنگ آبی

**زەنگارۆ**[٢]: ناوەڵناو. ژەنگاری ☰ زنگارزده

**زەنگاڵ / zengał/**: ناو. ١. ☜ **زەرگاڵ** ٢. ☜ **زەمبول**

**زەنگدار / zengdar/**: ئاوەڵناو. ١. زەنگی؛ بە زەنگ ‹سەعاتی زەنگدار› ٢. زایەڵەدار؛ بە زرنگە؛ زرنگەدار ‹دەنگی زەنگدار› ≡ ١و٢. زنگدار

**زەنگزڕیای / zengziřyay/**: ئاوەڵناو. *[کنایە]* ڕسوا؛ ناوزڕاو؛ ئابڕووتکاو ≡ رسوا

**زەنگل / zengil/**: ناو. ١. ☜ **زەنگۆڵە ـ١** ٢. ☜ **زەنگلۆک ـ٢**

**زەنگلاندن / zeng(i)landin/**: چاوگ. زەنگۆڵە لێ دان ≡ زنگوله نواختن

**زەنگلۆر / zeng(i)lor/**: ناو. تراشە؛ قلقانجک؛ ستۆکرک ≡ نای

**زەنگلۆک / zeng(i)lok/**: ناو. ١. باڵداریکی بچووکە لە چۆلەکە دەکا ٢. زەنگل؛ زەنگەلۆر؛ زەنگەلووک؛ زەنگەلۆک؛ لوولەیەکی ماسوولکەیی لە نێوان قوڕگ و گەدەدا ≡ ١. پرندەای از تیرەی گنجشک‌ها ٢. مری

**زەنگلین / zeng(i)lîn/**: چاوگ. زەنگۆڵە لێ دران ≡ زنگوله به صدا درآمدن

**زەنگڵ / zengił/**: ناو. ١. ☜ **زەنگۆڵە ـ١** ٢. ☜ **زەنگۆڵ[1] ـ٢**

**زەنگڵە / zeng(i)łe/**: ناو. ١. زەنگڵ؛ زەنگۆڵ ٢. گلیلە؛ گلیزە؛ چلوورە ‹سیلسیلەی پێچ ـ پێچ زولف نازاران/ زەنگڵە بەستەوەی جە دانەی واران «مەولەوی»› ≡ ١. زنگوله ٢. دنگاله

**زەنگڵەزیوە / zeng(i)łezîwe/**: ناو. باڵندەیەکی گچکەی بەرسینگ سوورە، لە بەرزایی دارانـدا هێلانە دەکا ≡ پرندەای کوچک

**زەنگڵەمیرە / zeng(i)łemîre/**: ☜ **زەنگوڵەمیرە**

**زەنگن / zengin/**: ناو. زەنگەن؛ کولینگ؛ قولنگ؛ ئامرازی زەوی کندن ≡ کُلنگ

**زەنگوقۆڕ / zeng û qoř/**: دەنگەناو. دەنگی زۆری زەنگۆڵەی گەورە ‹هات خرینگەی زەنگ‌وقۆڕ/ لوشەمەلوشم و هۆڕەهۆڕ «هێمن»› ≡ صدای پی‌درپی درای

**زەنگول / zengul/**: ☜ **زەنگۆڵە ـ١**

**زەنگولنە / zengulne/**: ناو. دیاری؛ پێشکێش ≡ پیشکشی؛ هدیه

**زەنگوڵ / zenguł/**: ناو. ١. تنۆک؛ دلۆپ ‹وێستاوە زەنگوڵ زەنگول/ ئاونگ لە سەر پەلکی گول «هێمن»› ٢. ترۆپکی کێو ٣. ☜ **زەنگۆڵە ـ١** ٤. کالەی لە موو ≡ ١. قطره ٢. قلەی کوه ٣. ☜ **زەنگۆڵە ـ١** ٤. چارق مویی

**زەنگوڵۆک / zengułok/**: ناو. بڵقی سەر ئاو ≡ حباب روی آب

**زەنگوڵە / zengułe/**: ☜ **زەنگۆڵە ـ١**

**زەنگوڵەمیرە / zengułemîre/**: ناو. زەنگڵەمیرە؛ سەیرە؛ مەلێکە لە تۆرەمەی سەیرە، نزیک ١٢ سانتی‌میترە، نێر و مێ یەک‌ڕەنگە، بە باڵی زەرد و ڕەش، کلکی ڕەش و سپی، دەم و چاوی سوور، پشتی قاوەیی بۆرەوە کە بۆ لای پاشەڵی سپی هەڵدەگەڕێ، پەڕ و باڵی پڕ لە خەت و خاڵی سوورگوێزییە، بە گەل لە باخ و زەوی و زاران دەژی، پاییز و زستانان لە بەیار و کەنار ڕێگایان دەبینرێ، هێلانە لە سەر چلووکی دار و پنچکان ساز دەکا ≡ سُهرەی معمولی

**زەنگون / zengun/**: ☜ **زەنگین**

**زەنگۆ / zengo/**: ناو. ئاوزەنگی ≡ رکاب

**زەنگۆڵ[1] / zengoł/**: ناو. ١. گوێزنگ؛ قاپی پێ ٢. زەنگل؛ دلۆپ ≡ ١. قوزک پا ٢. قطره

**زەنگۆڵ[2]**: ئاوەڵناو. تەمبەڵ؛ تەپلۆس ≡ تنبل

**زەنگۆڵە / zengołe/**: ناو. ١. زەنگولە؛ زەنگوولە؛ زەنگول؛ زەنگول؛ زنگل؛ زەنگل؛ زەنگل؛ زەنگڵە؛ چەنگ؛ گووشپارە؛ تەول؛ دێول؛ زەنگی گچکە کە پتر دەیکەنە ملی چوارپێیان ٢. ☜ **زەنگۆڵەگیا**

٣. شـــانەی زەردەواڵـــە ⬛ ١. زنگولـــه ٢. ☜

**زەنگۆڵەگیا** ٣. شانەی زنبور

**زەنگۆڵەبچک** / zengołebiçik/: ناو. نـاوی گولـێکە ⬛ گُلی است

**زەنگۆڵـەگیا** / zengołeg(i)ya/: نـاو. بـەرزەلینگ؛ زەنگۆڵە؛ بنەگیایەکی خۆڕسکە بـە لقـی باریـک، گەڵای وردی تێکئاڵاوی کولـکن و گوڵـی ورد و تۆپەڵـی بۆنخـۆش و هێنـدێک تـاڵ و تفتـەوە، پاڵاوتەی کوڵێنراوی گوڵ و گەڵاکەی دژی کرمی ڕیخۆڵەیە ⬛ خَنج

**زەنگۆڵەمیرە** / zengołemîre/: ناو. سەیرە ⬛ سُهره

**زەنگو** / zengû/: ناو. ١. قاپ؛ گوێزنگ ٢. ڕکێـف؛ ئاوزەنگی ⬛ ١. قوزک پا ٢. رکاب

**زەنگوولە** / zengûle/: ☜ **زەنگۆڵە ـ١**

**زەنگە** / zenge/: ناو. ١. نێـوان جومگـەی دەس و ئانیشک ٢. زەبلک؛ نێوان قولەقاپە و ئەژنۆی پا ٣. داری شکاوەی ئامادەکراو بۆ سووتان ⬛ ١. سـاعد ٢. ساق ٣. هیزم شکسته

**زەنگەتلیش** / zenget(i)łîş/: ناوەڵناو. کەڵ؛ کەڵەدار ⬛ قطعەی هیزم

**زەنگەتـە** / zengete/: نـاو. ١. ☜ **زەرگـەتـە** ٢. تلیسک؛ تیسک ⬛ ١. ☜ **زەرگەتە** ٢. تلسک

**زەنگـەتـەتـرێ** / zengetet(i)rê/: نـاو. شـــتووف؛ تلیسک؛ تیسک ⬛ تلسک

**زەنگەر ـ زەنگەر** / zenger zenger/: ناوەڵکار. لـەرە ـ لەرە؛ لەرزە ـ لەرزە ⬛ لرزان ـ لرزان

**زەنگەزمرە** / zengezimre/: ☜ **ژەنگەسورە**

**زەنگەزێڕە** / zengezêře/: ☜ **ژەنگەسورە**

**زەنگەسورە** / zengesûre/: ☜ **ژەنگەسورە**

**زەنگەڤۆر** / zengevor/: نـاو. زنگڤـۆر؛ قەرەباڵـغی؛ ئاپۆرە؛ پڕایی و تێکەڵ ـ پێکەڵی ⬛ ازدحام

**زەنگەقلیشـە** / zengeq(i)łîşe/: نـاو. قەڵاشـکەری؛ داری بە بیور شکاو ⬛ هیزم قطعه ـ قطعه شده

**زەنگەلۆر** / zengelor/: ناو. زەنگلۆک ⬛ مری

**زەنگەلۆرک** / zengelorik/: نـاو. کرکراکـە؛ خـڕایی ناوەڕاستی گەردن ⬛ بخشی از گردن

**زەنگەن** / zengen/: ☜ **زەنگن**

**زەنگـی**[١] / zengî/: نـاو. ١. ئـاوزەنگی ٢. قـاپ؛ گوێزنگ ⬛ ١. رکاب ٢. قوزک پا

**زەنگی**[٢]: ئاوەڵناو. وەکزەنگۆڵە ⬛ جرس‌آسا

**زەنگیالێ** / zeng(i)yalê/: ☜ **زەنگیانە**

**زەنگیانە** / zeng(i)yane/: ناو. زەنیانـە؛ زەنگیالـێ؛ مووورووی زۆر ورد ⬛ منجوق

**زەنگیانـــەفـــرۆش** / zeng(i)yanef(i)roş/: نـــاو. عەلاقەبەند ⬛ منجوق‌فروش

**زەنگیانـەهـۆن** / zeng(i)yanehon/: نـاو. قـــەزاز؛ عەلاقەبەند ⬛ منجوق‌کار

**زەنگین** / zengîn/: ئاوەڵناو. زەنگون؛ دەوڵەمەند ⬛ ثروتمند

**زەنندە** / zeninde/: ☜ **زەرەند**

**زەنوێر** / zenwêr/: ناو. جێگەی بلندی هەواسازگار ‹ئاوی هەڵدێرێ، دەشـتێ، زەنـوێرێ/ دلان ئـاو دەدا گولان دەدێـرێ «حـەقیقی»› ⬛ جـای بلنـد خـوش آب‌وهوا

**زەنە** / zene/: ناو. ئەنگێوی سەر پیتی ئەلفوبێ ⬛ سکون حروف

**زەنەق** / zeneq/: ☜ **زەندەق**

**زەنەقـدار** / zeneqdar/: ئاوەڵـناو. بەجـەرگ؛ ئـازا ‹زەنەق زەنەقدار ئەتۆقێ «مەسەل»› ⬛ شجاع؛ پُردل

**زەنـەک**[١] / zenek/: نـاو. زنـە؛ زن؛ بـاتلاغ؛ زۆنـگ؛ زەلکاو ⬛ باتلاق

**زەنـەک**[٢]: ئاوەڵـناو. *[شـوورەیی]* زۆر گانکـەر ⬛ بسـیار اهل جماع

**زەنی** / zenî/: نـاو. زنج؛ زەنج؛ زینج؛ زیقەنە؛ چەنە؛ چەناگە؛ چناکە؛ ئەرزینگ ⬛ زنخ؛ چانه

**زەنیانە** / zenyane/: ☜ **زەنگیانە**

**زەو** / zew/: ☜ **زاوزو**

**زەوا** / zewa/: ☜ **زاوا**

**زەواد** / zewad/: ناو. ١. تۆشە ٢. بژیو لە خەڵە ≡ ١. توشه ٢. مايحتاجِ غلّه

⊡ **زەواد برین:** /کنایی/ ١. نان خواردن ‹دوو ڕۆژە زەوادم نەبڕیوە› ٢. بڕینی ڕزق و ڕۆزی ‹خودایە ئەو تۆزە زەوادەشمان لێ‌نەبڕی!› ≡ ١. غذا خوردن ٢. روزی بُریدن

**زەواد کردن:** زەواد بڕین؛ نان خواردن ≡ غذا خوردن

**زەوار** / zewar/: ناو. پەرواز؛ تەختەی باریکی تاشراو بۆ قەراخی سندووق ≡ زَوار

**زەوارە** / zeware/: ☜ **زیوار**

**زەواڵەکات** / zewałekat/: ناو. تۆزکاڵ؛ تۆزقاڵ؛ هەندێکی زۆر کەم ≡ ذرّه

**زەوت**[1] / zewt/: ناو. زەبت؛ دابڕ؛ داگیر ‹لە ڕنوانە بکەم ڕەوت/ دوژمن بۆی نەکراون زەوت «هێمن»› ≡ غصب

⊡**زەوت کردن:** داگیر/ دابڕ کردن. هەروەها: **زەوت بوون؛ زەوت کران** ≡ غصب کردن

**زەوت**[2]: ئاوەڵناو. زەود؛ ئارام ≡ آرام

⊡ **زەوت بوون:** زەود بوون؛ هەدا دان؛ ئارام بوون ≡ آرام گرفتن

**زەوتەک** / zewtek/: ئاوەڵناو. فریودەر؛ خاپینۆک ≡ فریب‌دهنده

**زەوتی** / zewtî/: ئاوەڵناو. داگیرکراو ≡ غصبی

**زەوجی** / zewcî/: ئاوەڵناو. خاوەن‌ژن؛ بە ژن ≡ مُتأهل

**زەوجین** / zewcîn/: چاوگ. ژن هێنان ≡ ازدواج کردن

**زەود**[1] / zewd/: ناو. ١. بێگار؛ کاری بە زۆر ٢. قیژە و هەرا ٣. بژیو؛ زەواد ≡ ١. بیگاری ٢. جیغ و داد ٣. زاد؛ توشه

**زەود**[2]: ☜ **زەوت**[2]

⊡ **زەود بوون:** ☜ **زەوت بوون**

**زەودە** / zewde/: ناو. تێشووی ڕێگە ≡ توشه‌ی راه

**زەوزان** / zewzan/: ☜ **زۆزان**

**زەوزو** / zewzû/: ☜ **زاوزو**

**زەوق** / zewq/: ناو. ١. خۆشی؛ کەیف ٢. سەلیقە؛ پەسندی دڵ ≡ ١. لذت؛ خوشی ٢. سلیقه

**زەوک** / zewk/: ☜ **زەڤۆک**

**زەولان** / zewlan/: ناو. ١. زۆڵ؛ کالان ٢. زاولانە؛ زۆلانە؛ تۆقێکە لە ئەستۆی دیلی دەکەن ≡ ١. قلاده ٢. حلقه‌ی آهنی گردن اسیر

**زەولەرزە** / zewlerze/: ناو. بوومەلەرزە؛ زەلزەلە ≡ زلزله

**زەوڵە** / zewłe/: ناو. مەچەک ≡ مُچ

**زەوونج** / zewunc/: ناو. زۆنگ؛ زەوی ئاوتێزاو ≡ زمین باتلاقی

**زەوونگ** / zewung/: ناو. دۆڵمە گیپە؛ دۆڵمەی ڕیخۆڵە و گەدەی ئاژەڵ کە پڕی دەکەن لە برنج و برویش و سەوزی ≡ دُلمه درست شده از روده

**زەوە** / zewe/: ☜ **زیپکە-١**

**زەوەڕ** / zewer̄/: ناو. زمهەڕ؛ زمهاڕ؛ ئاردی هاڕدراو بۆ بژیوی زستانە ≡ آرد آذوقه‌ی زمستانی

**زەوەززە** / zewezze/: ☜ **زاوزو**

**زەوەزە** / zeweze/: ☜ **زاوزو**

**زەوەن**[1] / zewen/: ناو. ١. سوانە؛ گوێسوانە؛ سەر لێواری بان ٢. ☜ **زەبەند**[1] ≡ ١. برآمدگی لب بام ٢. ☜ **زەبەند**[1]

**زەوەن**[2]: ☜ **زەبەند**[2]

**زەوەند** / zewend/: ☜ **زەبەند**

**زەوەنگ** / zeweng/: ☜ **زەڤەنگ**

**زەوی** / zewî/: ناو. زەڤی؛ زەمین؛ زەوین؛ زەی؛ زەو: ١. وەڵ؛ هارزەو؛ هەرد؛ قاد؛ کاد؛ سەرزەوی؛ بەژ؛ عەرز؛ وشکی؛ وشکانی؛ ئەو بەشە لە گۆی

زەوی کـە ئـاو دای‌نـەگرتووە ٢. گـۆی زەوی ٣. پارچەیەک وشکانی، گەورە یان بچووک، کـە بـۆ کشـتوکـاڵ یـان مـاڵ لـە سـەرکردنەوە بشـێ ‹ئەوساڵ زەوییەکەم کردۆتە گەنم؛ زەوی کڕیوە مـاڵ بکاتەوە› ٤. عەرز؛ هەرد؛ تـەختی دیـو یـان هـەر شـوێنێکی‌تـر ‹کەوتـە سـەر زەوی› ٥. گۆڕەپـان؛ مەیدان؛ دەرەتانێ کـە بـۆ چالاکییـەکی تایبـەت دروست کـراوە ‹زەوی فووتبـاڵ› ☰ ١. خشـکی ٢. کرەی زمین ٣تا ٥. زمین

◘ **زەوی قـوت دان:** *[مەجاز]* ١. مـردن و خـەلاس بوون ٢. لە خەجاڵـەتان بوونـە تکـێ ئـاو؛ زۆر شەرمەزار بوون ٣. بزر/ گوم بوون ☰ ١. مُردن و راحت شدن ٢. از خجالت آب شدن ٣. گُم شدن

**زەوی و ئاسمان بە یەکا دان:** *[مەجاز]* لە دار و بەرد دان؛ هـەوڵ و تـەقالای زۆر دان ☰ زمـین و آسمان/ زمان را به هم دوختن

**چوونە زەویدا:** ١. بە زەویدا ڕۆچـوون ٢. *[کینایە]* یەکجار شەرمەزار بوون ☰ ١. در زمین فـرورفتن ٢. از شدم آب شُدن

**دانە زەویدا:** بە زەویدا دان ☰ زمین زدن

**کوتانە زەویدا:** بە زەویدا کوتان ☰ زمین زدن

**زەوی‌پێو** / zewîpêw/: نـاو. زەڤی‌پیڤ؛ ئەنـدازیاری زەوی پێوان ☰ مهندس مسّاح

**زەویژی** / zewîjî/: ئاوەڵنـاو. ١. بـە تایبەتمەنـدی و ڕاهاتن بە ژیان لە سەر زەوی ٢. بە تایبەتمەندی و ڕاهاتن بە ژیان لە سەر وشکانی ☰ ١. زمـین‌زی ٢. خشکی‌زی

**زەویکێڵ** / zewîkêl/: ناو. بکێڵ؛ کەسێ بە جـووت یان بە بێڵ زەوی وەردەگێڕێ ☰ شخم‌زن

**زەویلـەرزە** / zewîlerze/: نـاو. بوومەلـەرزە ☰ زمین‌لرزە

**زەوین** / zewîn/: ☜ **زەوی**

**زەویناس** / zewînas/: ناو. ئەرزناس ☰ زمین‌شناس

**زەویناسی** / zewînasî/: ناو. زانستی ناسینی زەوی، ماک و قۆناخـەکانی چـێ بـوونی، بەتایبـەت بـە لێکۆڵینەوە لە سەر خاک و بـەرد و پێکهاتـەکانی ☰ زمین‌شناسی

**زەوینگیر** / zewîngîr/: ☜ **زەمینگیر**

**زەوینی** / zewînî/: ئاوەڵناو. زەمـینی: ١. سـەر بـە زەوی ‹بەرهەمی زەوینی› ٢. سەر بە گـۆی زەوی ‹گیانداری زەوینی› ٣. بـەژی؛ سـەر بـە وشـکی ‹هێزی زەوینی› ☰ ١تا٣. زمینی

**زەوی و زار** / zewîwzar/: ناو. مووچـە؛ کێڵـگە ☰ مزرعە

**زەوییانە** / zewîyane/: ناو. پیتـاکی زەوی ☰ بـاج زمین

**زەهـا**[١] / zeha/: نـاو. ١. زا؛ کـاری زان ٢. ژەک؛ هـەوەڵشـیر ٣. *[شوورەیی]* کـوز؛ قـوز؛ شـەرمی مێوینە ٤. هەژدیها ☰ ١. زایـش ٢. آغـوز ٣. کُـس؛ شرمگاه مادینه ۴. اژدها

**زەها**[٢]: ئاوەڵناو. وشک؛ زوها ☰ خُشک

**زەهاسە** / zehase/: ناو. زەماوەند؛ هاوسەرگیری ☰ ازدواج

**زەهاک** / zehak/: ☜ **زەحەک**

**زەهان** / zehan/: ☜ **زهین**

**زەهاو**[١] / zehaw/: ناو. زنە؛ زن؛ ئـاوێ کـە لـە ژێـر زەوییەوە هەڵدەقوڵێ و سەر زەوین دادەگـرێ ☰ زِهاب

**زەهاو**[٢]: ئاوەڵناو. ١. زیندوو ٢. ئاوەدان ☰ ١. زنده ٢. آباد

**زەهر** / zehr/: نـاو. ١. ژەهر؛ ژار ٢. زار؛ دەڤ ☰ ١. سَم ٢. دهان

◘ **زەهری مان:** ☜ **زەهرەمار**

**زەهری هەلایل:** هەلایهەل: ١. ژاری گیانلەبەرانی نێو دیرۆکان کە گوایە زۆر بکوژ بووە ٢. *[کینایە]* شتی زۆر تاڵ و ناخۆش ٣. جوێنێکە ☰ ١. زهر

هلاهِل ٢. بسیار تلخ ٣. دشنامی است

**بە زەهری مار کردن:** ☜ **کردنە زەهری مار**

**کردنە زەهری مار:** *[کینایە]* بە زەهری مار کردن؛ کردنە ژەقنە/ ژەقنەمووت: ١. ناقایل بوون بە بەشی کەمی خۆ ‹تف لەو بەشە! لەو ژیانە حافزا/ ئەو نانە بکەی بە زەری ماری «مەلا غەفوور»› ٢. ناقایل بوون و پێ زۆر بوونی بەشی کەسێک ‹هەمووی برد؟ دەک بیکاتە زەهری ماری!› ٣. خواردن و تەواو کردن (بە سووکایەتی و ناسزا) ‹دە زوو بە! بیکە زەهری مارت!› ☗ ١و٢. زهر مار کردن ٣. کوفت کردن (خوردن)

**زەهراو** / zehraw/: ناو. ١. ژەهری تراو ٢. *[کینایە]* میز؛ مێز؛ پێشاو ☗ ١. سَم آبکی ٢. ادرار

**زەهراوی** / zehrawî/: ئاوەڵناو. تێکەڵاو بە ژەهر ☗ زهرآلود

**زەهرچاو** / zehrçaw/: ناو. تماشای بە ڕقەوە؛ چۆنیەتی مۆڕ بوونەوە ☗ آغیل؛ نگاه خشم‌آلود

**زەهرخەنە** / zehrxene/: ☜ **زارخەن**

**زەهردار** / zehrdar/: ئاوەڵناو. ژەهراوی ☗ سمی

**زەهرەمار** / zehremar/: سارستە. زەهرەممار؛ ژەهرەمار؛ ژاعریامار؛ زەهری هەلایل؛ قوزلقورت؛ ژەقنە؛ ژەقنەمووت؛ ژەقنەبووت: ١. *[کینایە]* نوێنەی تالی و ناخۆشی ٢. سندان؛ سنان؛ دەردی‌کاری؛ دەری؛ گەڕانی؛ جۆرە جنێوێکە لە وەرامدانەوەی قسە یان پێکەنینی نابەجێی کەسێکدا ‹بەڵێ و زەهرەمار! دانارزی؟› ☗ ١و٢. زهرمار

**زەهرەممار** / zehremmar/: ☜ **زەهرەمار**

**زەهف** / zehf/: ☜ **زاف**

**زەهفان** / zehfan/: ناو. کۆمەڵ؛ تاقم ☗ گروه؛ دسته

**زەهلک** / zehlik/: ☜ **زراو[١]ـ١**

**زەهلە** / zehle/: ناو. ١. ☜ **زراو[١]ـ١** ٢. *[کینایی]* ورە؛ هێزی دل ☗ ١. ☜ **زراو[١]ـ١** ٢. شُجاعت

▣ **زەهلە بردن:** *[مەجاز]* ترساندن؛ زاڵە بردن ☗ ترساندن

**زەهلەبەر** / zehleber/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ترسێنەر ☗ ترساننده

**زەهمان** / zehman/: ناو. قەبران؛ قەورسان ☗ گورستان

**زەهەک** / zehek/: ناو. زەهاک؛ زەو ‹بزنەکان زەهەکیان تێکەوتووە› ☗ زایش

**زەهی** / zehî/: ناو. زەرەر؛ خوسار ☗ ضرر

**زەهین** / zehîn/: ☜ **زەهین**

**زەی** / zey/: ☜ **زەوی**

**زەیتوون** / zeytûn/: ناو. ١. دارچکێک بە کۆتەرەی لێک‌ئالا و لق و پۆدار، گەڵای سەوزی بریقەدار و پشت زێوییەوە ٢. بەری ئەو دارچکە کە گۆشتن، چکۆلە، خۆراکی، زرو، ڕەش یان سەوزە، خواردنێکی بەناوبانگە و ڕۆنیشی لێ‌دەگرن ☗ ١و٢. زیتون

**زەیتوونی[١]** / zeytûnî/: ناو. کەسکەتاری؛ ڕەنگی سەوزی وەکوو ڕەنگی زەیتوون ☗ زیتونی

**زەیتوونی[٢]**: ئاوەڵناو. کەسکەتاری؛ بە ڕەنگی زەیتوون ☗ زیتونی

**زەیسان** / zeysan/: ناو. زاوران؛ زاوەران؛ زەیستان؛ زیسان؛ زێسان؛ زەیسانە؛ ژنێ کە تازە زاوە یا دەزێ ☗ زائو

**زەیسانە** / zeysane/: ☜ **زەیسان**

**زەیستان** / zeystan/: ☜ **زەیسان**

**زەیف** / zeyf/: ناو. گزە؛ فێڵ (لە یاری و مامەڵەدا) ☗ نارو

▣ **زەیف لێدان:** گزە لێ کردن ☗ نارو زدن

**زەیقەت** / zeyqet/: ناو. ئازار و ناخۆشی ‹پێم ناوێرن دەرد و زەیقەت› ☗ اذیت و آزار

**زەین** / zeyn/: ناو. ١. بیر؛ هزر ٢. زەنبەر؛ خشڵ ٣. ڕەوش؛ خەمڵ ☗ ١. ذهن ٢. زیور ٣. آرایش؛

تزيين

**زەین‌ڕوون** / zeynřûn/: ئاوەڵناو. بەبیر؛ بەهۆش؛ زرنگ ☰ باهوش

**زەین‌کوێر** / zeynk(i)wêr/: ئاوەڵناو. بێ‌هۆش؛ نازرنگ ☰ کودن

**زەینین** / zeynîn/: چاوگ. زەیینین: ١. ڕازانەوە ٢. ڕوانین و هۆش دان ☰ ١. آراسته شدن ٢. دقت کردن

**زەیە** / zeye/: ئاوەڵناو. سفت‌تەنراو ☰ مُحکم تنیده

**زەیی** / zeyî/: ناو. خزم و کەسی زۆر نزیک ☰ اقوام نزدیک

**زەیینین** / zeyînîn/: ☜ **زەینین**

**زهار** / z(i)har/: ☜ **زهاك**

**زهاك** / z(i)hak/: ناو. زهار؛ حەزیا؛ هەژدیها ☰ اژدها

**زهی** / z(i)hî/: ناو. زێ؛ کاری چوونەوە باوان؛ سەردانی بووک بۆ ماڵ باوک پاش حەفتەیەک ☰ دیدار عروس از منزل پدری پس از یک هفته از ازدواجش

**زهین** / z(i)hîn/: چاوگ. زایین؛ زان؛ زەهان؛ زەهین؛ مناڵ هاوردن ☰ زاییدن

**زهێ** / z(i)hê/: ناو. کاتی مناڵ هێنانی ژن ☰ هنگام زایمان

**زێ**[1] / zî/: ناو. ١. ڕەپێ؛ دەرپەڕیوی ٢. ☜ **زریشك** ٣. دڕکەزێ؛ دەوەنە؛ دڕکێکە ٤. گشتەکی پینەچی ٥. پێسیر؛ بەرۆک ٦. پێنج هەستی سەرەکی، بریتی لە هەستی تایبەتی دەست، چەژە، بۆن، بیستن و دیتن ٧. ☜ **زهی** ☰ ١. برآمدگی ٢. ☜ **زریشك** ٣. خاری است ۴. رشتەی پینەدوزی ۵. گریبان ۶. حس؛ حواس پنجگانە ٧. ☜ **زهی**

**زێ**[2]: ☜ **زەو**[2]**ـ١**

**زیا**[1] / z(i)ya/: ناو. هەژدیها؛ حەزیا ☰ اژدها

**زیا**[2]: ☜ **زیاد**

**زیابەشانە** / z(i)yabeşane/: ناو. کاکەبەشانە؛ کاری خاترگرتنی کەسێک لە چاو باقی ☰ اضافە سهم

**زیاد**[1] / z(i)yad/: ئاوەڵناو. زیا؛ زۆر؛ زەحف؛ زاف؛ پڕ؛ پوڕ ‹ئەمە بۆ من زیادە› ☰ زیاد

▣ **خوا زیاد کردن**: *[نزا]* سارستەیەکە دوای خواردنی شتێک بۆ پیت و بەرەکەت تێ کەوتن، یان سپاسگوزاری، بە شێوەی «خودا زیادی کا» دەگوترێ ☰ خدا برکت دادن

**زیاد**[2]: ئاوەڵکار. زیا؛ زۆر؛ فرە؛ گەلێک ‹زیاد لەم کارە دڵنیا نیم!›. هەروەها: **زیاد بوون؛ زیاد کردن** ☰ زیاد

**زیادە**[1] / z(i)yade/: ناو. ١. زیاردە؛ سێزدە؛ یەک و دوازدە ٢. گرووز؛ لک؛ زەقی یا دەرپەڕیوی، بەتایبەت لە ئەندامەکاندا ☰ ١. سیزده ٢. زایده

**زیادە**[2]: ئاوەڵناو. لەڕادەبەدەر ‹بەشی زیادە› ☰ بیش از حد

**زیادە**[3]: ئاوەڵکار. لەڕادەبەدەر ‹زیادەم ناوێ› ☰ بیش از حد

**زیادی**[1] / z(i)yadî/: ئاوەڵناو. زیایی: ١. زۆر ‹زەحمەتی زیادی› ٢. ناپێویست ‹قسەی زیادی› ☰ ١. اضافی ٢. غیرضروری

**زیادی**[2]: ئاوەڵکار. زیایی؛ بە شێوەیەکی ناپێویست ‹زیادی قسەی کرد› ☰ اضافی

**زیار** / z(i)yar/: ناو. لەواشەی دەمی وڵاغ ☰ دهن‌بند ستور

**زیاردە** / z(i)yarde/: ☜ **زیادە**[1]**ـ١**

**زیارەت** / z(i)yaret/: ناو. ١. چاک و پیر؛ شەخس ٢. کاری چوونە دیداری چاک و پیران ٣. *[مەجاز]* قەبر؛ گڵکۆ ☰ ١. مزار مقدس ٢. زیارت ٣. گور

▣ **زیارەت کردن**: ١. ماچ کردنی دەستی مورشید یا شتی پیرۆز ٢. چوونە سەر گڵکۆی چاکان

یان شوێنی پیرۆز ☰ ۱. بوسیدن دست مُرشد یا چیزهای متبرک ۲. سر خاک یا اماکن مقدس رفتن

**زیارەتان** / z(i)yaretan/: ناو. ۱. چاک و پیر؛ شەخس ۲. *[کینایە]* قەبران؛ قەورسان ☰ ۱. مقبرەی بزرگان ۲. گورستان

**زیارەتگا** / z(i)yaretga/: ناو. جێگەی زیارەت ☰ مزار

**زیارەتگە** / z(i)yaretge/: ناو. زێوە؛ قسن؛ خزن ☰ زیارتگاه

**زیارەوی** / z(i)yařewî/: ناو. زێدەڕۆیی؛ تەلاس؛ چۆنیەتی زۆرتر لە پێویست لە کارێکدا چوونە پێش. هەروەها: **زیارەوی کردن** ☰ زیادەروی

**زیان** / z(i)yan/: ناو. زرار؛ زەرەر؛ زەرەد؛ زەر؛ خوسار ☰ زیان

⊡ **زیان (پێ)گەیاندن**: زەرەر لێ دان ☰ زیان زدن

**زیان پێ گەیشتن**: زیان دیتن؛ زەرەر لێ کەوتن ☰ خسارت دیدن

**زیان دیتن**: ☜ **زیان پێگەیشتن**

**زیان کردن**: ۱. زەرەر کردن ۲. زەرەر لە خەڵک دان ۳. *[کینایە]* منداڵ لە بەر چوون ☰ ۱. زیان دیدن ۲. زیان رساندن ۳. سقط شدن جنین

**زیاندار** / z(i)yandar/: ئاوەڵناو. زیانکار؛ دەس بەزەرەر ☰ زیان‌رسان

**زیاندەر** / z(i)yander/: ئاوەڵناو. زەرەردەر ☰ ضرررسان

**زیانکار** / z(i)yankar/: ☜ **زیاندار**

**زیانۆک** / z(i)yanok/: ئاوەڵناو. زیانیدەر: ۱. زەرەردەر ۲. زیانەخورۆ؛ لێهاتوو یان خووگرتوو بە زەرەر گەیاندن ‹مشک جانەوەرێکی زیانۆکە› ☰ ۱. زیان‌آور ۲. آسیب‌رسان

**زیانەخرۆ** / z(i)yanex(i)ro/: ☜ **زیانەخورۆ**

**زیانەخورۆ** / z(i)yanexuro/: ئاوەڵناو. زیانەخرۆ؛ زانەخرۆ؛ زیانی؛ زیانیخورۆ: ۱. فێری مریشک خواردن بوو (سەگ) ۲. تایبەتمەندی ڕەشەوڵاخێ کە خۆ دەدزێتەوە و دەچێتە ناو مەزرای خەڵکەوە ‹گا و گوێرەکەی سەرەڕۆ/ ئاژاڵی زیانەخورۆ «گۆران»› ۳. زیاندەر؛ زیانۆک ☰ ۱. مُرغ‌ربا (سگ) ۲. زیان‌رسان بە مزارع (دام) ۳. آسیب‌رسان؛ زیان‌رسان

**زیانی**[1] / z(i)yanî/: ناو. شوێنێ کە ئاژەڵ و مێگەل بچنە ناوی، دەبێتە هۆی زیان ☰ جایی کە ورود احشام بدان موجب خسارت شود

⊡ **زیانی کردن**: ڕان و مێگەل چوونە/ بردنە ناو زیانی ☰ رفتن/ بردن احشام به جایی که موجب خسارت شود

**زیانی**[2]: ئاوەڵناو. ۱. ☜ **زیانەخورۆ** ۲. تایبەتمەندی شوێنێ کە ئاژەڵ و مێگەل لەوەڕاندن لەوێ قەدەغەیە ☰ ۱. ☜ **زیانەخورۆ** ۲. ویژگی جایی که چریدن احشام در آن ممنوع است

**زیانیخورۆ** / z(i)yanîxuro/: ☜ **زیانەخورۆ**

**زیانیدەر** / z(i)yanîder/: ☜ **زیانۆک**

**زیای** / z(i)yay/: چاوگ. ۱. چوونە دەرەوە ۲. سەوز بوون ۳. ئەنگووتن؛ هەڵهاتن ٤. دەرهاتن ٥. دەرکەوتن ☰ ۱. بیرون رفتن ۲. روییدن ۳. برآمدن ۴. درآمدن ۵. ظاهر شدن

**زیایی** / z(i)yayî/: ☜ **زیادی**

**زیبا** / zîba/: ئاوەڵناو. زێبا؛ جوان؛ خوشیک؛ خوشکۆک ☰ زیبا

**زیبک** / zîbik/: ☜ **زیبك ـ۱**

**زیپ** / zîp/: ناو. ۱. ڕۆژی تووش و شووم ۲. کاری بە تەوژم پەستاوتن ۳. ☜ **زیپە** ٤. هەرا و هوریا ٥. چورت؛ قیر؛ جۆرێ بەس (بۆ هەڵپێکانی جل‌وبەرگ، کیف و ...) بریتی لە دوو ڕزن ددانە و گیرەیێ کە بە کێشانی بەرەو لایێ دەبەسرێ و بەرەو لایەکیتر دەکرێتەوە ☰ ۱. روز نحس ۲. فشار ۳. ☜ **زیپه** ۴. جار و جنجال ۵. زیپ

⊡ **زیپ بۆ هاوردن**: ۱. گوشـار دان ۲. خسـتنه تەنگانەوە ✱ هەروەها: **زیپ بۆ هاتن** ≡ ۱. فشار دادن ۲. زیر منگنه گذاشتن

**زیپك** / zîpik/: ناو. ۱. زیبک؛ بڕشت لـه قانوونـدا ‹پشتی نەکرد لە میللەت/ وا دەبێ زیپک و هیممەت «هێمن»› ۲. زیپکە؛ بـەردی زۆر چکۆڵـە کـە بـە پیتکـە دەهـاوێژرێ ۳. ☜ **زیپـە** ٤. هـەوەڵ حەوتەی بەهار ٥. زیپکە؛ زڕکـە ٦. *[مەجاز]* تانـە دە پەردەدا ۷. تەرزە؛ تەزرە؛ تـەیرۆک ۸. دڵـۆپە؛ تکەی بان ۹. چەکەرە ≡ ۱. قاطعیـت در حکـم ۲. شن بادامی ۳. ☜ **زیپـە** ۴. اولـین هفتـەی بهـار ۵. جوش صورت ۶. کنایە؛ متلک ۷. تگـرگ ۸. چکـەی بام ۹. جوانەی تازەی گیاه

⊡ **بەزیپک و زاکۆن**: بەزیپک و زاکۆن؛ بەبڕشـت و قانووندار ‹ڕێبـوارێکم ئـازا و بـەزیبک و زاکـوون/ دەبڕم چۆڵ و چیا و پێدەشت و بێروون «هـێمن»› ≡ قاطع و قانونمند

⊡ **زیپک تێگرتن**: *[کنایە]* قسـەی بـە تێکـوڵ بـە کەسێ وتن ≡ طعنه زدن

**زیپکگۆیی** / zîpikgoyî/: ناو. فرغـە؛ ئیرادگـری ≡ ایرادگیری

**زیپکە** / zîpke/: نـاو. ۱. زیـڕک؛ زڕکـە؛ زڕـک؛ زڕپک؛ زوە؛ زەوە؛ زیتکە ۲. *[مەجاز]* زیپک؛ قسەی بە تێکوڵ ۳. ☜ **زیپك ـ۲** ≡ ۱. جوش پوسـت ۲. کنایە؛ متلک ۳. ☜ **زیپك ـ۲**

**زیپلك** / zîplik/: ناو. ژیلـە؛ ژیلـەمۆ؛ زیلـەمۆ؛ وردە پەنگری ناو خۆڵەکەوە ≡ اخگر زیر خاکستر

**زیپۆ** / zîpo/: نـاو. چەقە و هەرا ≡ جنجـال و سـر و صدا

**زیپە** / zîpe/: زیپک؛ زیپ؛ سەرمای پیرێژن؛ سـێ ڕۆژی دوایـی مـانگی ڕێبەنـدان و چـوار ڕۆژی هەوەڵی ڕەشەمە ≡ بردالعجوز؛ سرمای پیرزن

**زیپەڕ** / zîpeř/: ناو. ماسوولە؛ مایچە ≡ عضله

**زیت**[۱] / zît/: ناو. گەف؛ هەڕەشە ≡ تهدید

**زیت**[۲]: ئاوەڵناو. ۱. زرنگ؛ وریا؛ وشـیار ۲. لـە سـەر هەست ۳. ساز؛ بەکەیف ≡ ۱. زرنـگ؛ هوشـیار ۲. تیز (چشم و گوش) ۳. سرزنده؛ سرحال

⊡ **زیت بوونەوە** ۱. ڕاپەڕین و ڕاکـردنی گیانـەوەر ۲. *[کنایە]* وشیار بوونەوە و فریـو نـەخواردن ≡ ۱. رم کـردن حیـوان ۲. هُشـیار شـدن و فریـب نخوردن

**زیتەو بوون**: چاو تیژ کردن و ڕوانین ≡ تیز نگـاه کردن

**زیترك** / zîtrik/: ناو. لووشکە؛ جووتە ≡ جُفتک

**زیتك** / zîtik/: نـاو. ۱. جووتـە؛ لووشـک؛ لەقـە ۲. زمانەی ئاغزوونە ۳. بـالان؛ تەڵـەی گـورگ ≡ ۱. جفتک ۲. زبانەی سگک ۳. تلەی گرگ

**زیتكە** / zîtke/: نـاو. ۱. زمانەی تەڵەی ڕاو ۲. ☜ **زیپکە ـ۱** ≡ ۱. زبانەی تله ۲. ☜ **زیپکە ـ۱**

**زیتكەزەلام** / zîtkezelam/: ☜ **زیتكەسڵام**

**زیتكەسڵام** / zîtkes(i)łam/: نـاو. زیتکـەزەلام؛ باپشکێو؛ چینچکەسلاو ≡ گُل‌مُژه

**زیتـە** / zîte/: نـاو. ۱. پەلەپیتکـەی چـەک و تەقەمەنی ۲. دارووکەیەکە دە ناو فاقەدا بـۆ ڕاوی مەل ≡ ۱. ماشەی اسـلحه ۲. چـوبکی در نـوعی دام برای شکار پرنده

**زیتەزیت** / zîtezît/: ئاوەڵکار. *[پلار]* دۆخی بە چاوی زیتەوە سەیر کردن و شـەرم نـەکردن ≡ خیـره ـ خیره؛ حالت خیره شدن و شرم نکردن

**زیتەڵ** / zîteł/: ئاوەڵناو. زرنگ ≡ زرنگ

**زیتەڵـە** / zîtełe/: ئاوەڵـناو. زرنگـی پچکۆڵـە ≡ کوچولوی زرنگ

**زیچ**[۱] / zîç/: نـاو. ۱. پـێ‌لەقـەی مـرۆ ۲. زیتـک؛ جووتەی یەکسم ۳. دۆخی کاردانەوە؛ کـارێ بـە هۆی کارێکی‌ترەوە ٤. ورووژە؛ چۆنیەتی شڵـەژان و شێوان ٥. وردە بەردێ کە منداڵ گەمـەی پـێ

دەکەن ☰ ۱. لگد آدمی ۲. جُفتک ستور ۳. واکنش ۴. هیجان ۵. سنگریزەی بازی کودکان

**زیچ**[2]: ئاوەڵناو. زیت؛ چاوتیژ ☰ تیزچشم

**زیچاو** / zîçaw/: ناو. ئاوی شلوێ؛ لێڵ ☰ آب کدر

**زیچک** / zîçik/: ناو. ۱. ☜ **زنچك**ـ۲ ۲. گەمەیەکی منالانە بە داروکە دەیکەن ☰ ۱. ☜ **زنچك**ـ۲ ۲. از بازی‌های کودکان

**زیچکاو** / zîçkaw/: ☜ **زنچکاو**

**زیچین** / zîçîn/: ناو. قەمچان ☰ یەقُل دوقُل

**زیچێن** / zîçên/: ناو. گەمەیەکی منالانە بە وردەبەرد ئەیکەن ☰ از بازی‌های کودکان

**زیخ**[1] / zîx/: ناو. ۱. خیز؛ زخ؛ ڕیخ؛ وردەبەردی دەم چەم ۲. شیش؛ سیخ ۳. دڕکی ئەستووری دار ☰ ۱. شن؛ سنگریزه ۲. سیخ ۳. خار کُلُفت چوبی

**زیخ**[2]: ئاوەڵناو. ۱. ئازا؛ بوێر ۲. زیت؛ زرنگ ☰ ۱. پُردل؛ شجاع ۲. زرنگ

**زیخان**[1] / zîxan/: چاوگ. ۱. پاڵ پێوە نران ۲. هانە دران ☰ ۱. هُل داده شدن ۲. تحریک شدن

**زیخان**[2]: ناو. ۱. دنە؛ هان ۲. پاڵ؛ بوق ☰ ۱. تحریک ۲. هُل؛ فشار

**زیخاندن** / zîxandin/: چاوگ. ۱. هانە دان؛ دنە دان ۲. *[کینایە]* پاڵ پێوەنان؛ دەڵەک دان ☰ ۱. تحریک کردن ۲. هُل دادن

**زیخت** / zîxt/: ☜ **زەخت**

**زیخگە** / zîxge/: ☜ **زیخەڵان**

**زیخماڵ** / zîxmał/: ناو. خۆڵماڵ؛ کاری ساوینی دەفر لە کاتی شۆردندا بە خۆڵ و زیخ ☰ شن‌سابی

**زیخەڵان** / zîxełan/: ناو. زیخگە؛ زیخەڵانی؛ خیزەلان ☰ شنزار

**زیخەڵانی** / zîxełanî/: ☜ **زیخەڵان**

**زید** / zîd/: ئاوەڵناو. دژ؛ پێچەوانە ☰ مُقابل؛ ضد

**زیر**[1] / zîr/: ناو. زیرگ؛ چلک ☰ چرک

⊡ **زیر تێ دان**: چلک هەڵاوردن ☰ چرک گرفتن

**زیر**[2]: ئاوەڵناو. زوور؛ زوویر ☰ قهرکرده؛ ناراضی

**زیراڤ** / zîrav/: ئاوەڵناو. ۱. هاڕدراو؛ زۆر وردکراو ۲. دوورەدەست ☰ ۱. خُرد شده ۲. دور از دسترس

**زیراکس** / zîraks/: ناو. ۱. شێوەیەک بۆ وێنەگرتن لە بەڵگە ۲. هەر شتێ کە بەو جۆرە گیرابێ ☰ ۱و۲. زیراکس

**زیران** / zîran/: ناو. شووفار؛ جاسووس؛ زوانگر ☰ جاسوس

**زیرانی** / zîranî/: ناو. شووفاری؛ جاسووسی ☰ جاسوسی

**زیرچ** / zîrç/: ناو. جیقنەی مەل ☰ فضلەی پرنده

**زیرزیقاوڵە** / zîrzîqawłe/: ☜ **زیقاوە**

**زیرفوون** / zîrfûn/: ناو. زیزفوون؛ جۆرێ گیای ڕازێنەیی بە شێوەی دار، دەوەن، بنچک یان گژ و گیا بە گەڵای ناوە ـ ناوە، گوڵی مریس و بەری وشکەوە کە بۆ چەن مەبەستی جۆراوجۆر بە کار دەچێ ☰ زیرفون

**زیرقاوڵە** / zîrqawle/: ☜ **زیقاوە**

**زیرگ** / zîrig/: ناو. ۱. زوورک؛ زورکان ۲. چلک؛ کرێژ؛ لێشک ☰ ۱. تپه‌ماهور ۲. چرک

**زیرگن** / zîrgin/: ئاوەڵناو. چلکن؛ چەپەڵ؛ گەمار؛ پیس ☰ کثیف

**زیرن** / zîrin/: ☜ **زیرە**

**زیروە** / zîrwe/: ناو. ۱. زریوە ۲. شنە ☰ ۱. درخشش ۲. نسیم

**زیرۆ** / zîro/: ☜ **زارو**ـ۱

**زیرە** / zîre/: ناو. ژیرە؛ زیرن؛ کومین: ۱. گیایەکی ئالیکی پایا، بێ‌کولک، بە ڕیشووی هەڵمساو، لاسکی ڕێک، گەڵای ناسک و باریک، گوڵی سپی و گۆپکەی چەترئاساوە ۲. بەری ئەو گیایە کە دانێکی چووکی بۆنخۆشە و وەک بەهارات بەکار دەچێ ☰ ۱و۲. زیره

**زیرەڤان** / zîrevan/: ناو. زێرەڤان؛ زێرەڤان؛

زێرەوان: ١. جەزایرچی؛ ئێشک‌گر ٢. شـووفار ☰ ١. نگهبان؛ پاسبان ٢. جاسوس

**زیرەک / zîrek/:** ئاوەڵناو. ١. زرینگ؛ زرنـگ؛ فـرز؛ زرت؛ چالاک؛ چەلەنگ؛ بەدەستوبـرد؛ تزوسـک ٢. وریا؛ وشـیار ‹قوتـابی زیـرەک› ٣. هایـا؛ ژیـر؛ بەهۆش ‹موبایلی زیرەک› ☰ ١. زیرک ٢. هوشیار ٣. هوشمند

**زیرەکی / zîrekî/:** ناو. زرینگی؛ زرنگی ☰ زرنگی

**زیرەوا / zîrewa/:** ناو. زیرەوان؛ شووفار ☰ جاسوس

**زیرەوان / zîrewan/:** ☜ **زیرەوا**

**زیرین / zîrîn/:** ئاوەڵناو. زیرگن؛ چڵکن ☰ کثیف

**زیڕ / zîř/:** ☜ **زیل[٢]ـ٢**

**زیڕانـدن / zîřandin/:** چـاوگ. تێپەڕ. //زیرانـدت؛ دەزیڕێنی؛ بزیڕێنە// زیڕانن؛ دەنگ لێ بڵـند بـوون لە ژان یان لە ترسان ☰ جیغ کشیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەزیڕاندن

**زیڕانن / zîřanin/:** ☜ **زیڕاندن**

**زیڕزیـڕە / zîřzîře/:** نـاو. سیسـرک؛ شیڕشـیڕە ☰ جیرجیرک

**زیڕزیڕەک / zîřzîřek/:** ☜ **زیڕزیڕەك**

**زیـڕژن / zîřjin/:** نـاو. هـاواری لـە ناکـاو ☰ جیـغ ناگهانی

**زیڕوهـۆڕ / zîř û hoř/:** ناو. هەرا و قیژە ‹کە ئـەوەی بینی کیژی شەنگ و شۆڕ/ لـەوێ ڕانیشـت و کردیـە زیڕوهۆڕ «هێمن»› ☰ جیغ و داد

**زیڕۆح / zîřoĥ/:** ناو. گیاندار؛ گیانلەبـەر؛ گیانـەوەر ☰ موجود زنده

**زیڕە / zîře/:** ناو. دەنگی بەرز لە ژانێ یان لە ترسان ☰ جیغ

⊡ **زیڕە کردن:** *[مەجاز]* ١. لە ترسـان مـردن ٢. زۆر ترسان ☰ ١. از ترس مُردن ٢. سخت ترسیدن

**زیڕەزیڕ / zîřezîř/:** دەنگەناو. زیڕەی زۆر ☰ جیـغ و داد

**زیڕەکەر / zîřeker/:** نـاو. هاوارکەر؛ خودانی بانگ و هاوار ☰ فریاد کننده

**زیز / zîz/:** ئاوەڵناو. زوور؛ زوویر؛ زویر؛ زیر؛ تۆراو ☰ قهر

⊡ **زیز بوون:** تۆران ☰ قهر کردن

**زیز کردن:** تۆراندن ☰ رنجاندن

**زیزان / zîzan/:** ☜ **زیزانە**

**زیزانە / zîzane/:** ناو. زیزان؛ دەنکێکی تاڵە لە نـاو گەنمدا ☰ دانه‌ای تلخ در گندمزار

**زیزڕەمەندێ / zîzřemendê/:** ☜ **زڕەمەندی**

**زیزفوون / zîzfûn/:** ☜ **زیرفوون**

**زیـزک / zîzik/:** نـاو. ١. ☜ **زیسـك** ٢. مێشـێکی کەسکە ☰ ١. ☜ **زیسك** ٢. مگس سبز

**زیزمەنـدێ / zîzemendê/:** نـاو. گیاسـ‍ـــیڕێژ؛ بەلبەلەشوانێ ☰ گیاهی است

**زیزی / zîzî/:** ناو. زویـری؛ تـۆراوی ‹لـە ئاسـۆیەکی دوورەدەسـت، ئـاوا بـوو زەردەی پـاییزی/ دەتگـوت بووکێکی بێ‌نازە، پەردە جێ دێڵێ بە زیزی «هێمن»› ☰ قهر و ناخشنودی

**زیزیک / zîzîk/:** ناو. مێشێکی کەسکە بەڵای ڕەزە ☰ مگس سبز آفت تاک

**زیسان / zîsan/:** ☜ **زەیسان**

**زیسانی / zîsanî/:** ناو. وەختی زان ☰ هنگام زایمان

**زیسک / zîsik/:** ناو. زیزک؛ مووسڵی ☰ موسیر

**زیڤ / zîv/:** ☜ **زیو-١**

**زیڤار[١] / zîvar/:** ناو. زیڤاڵ؛ زوێڵ؛ پارچەی بڕاو لـە چەرم ☰ تسمه‌ی چرمی

**زیڤـار[٢]:** ئاوەڵـناو. ١. فـەقیر و هـەژار ٢. جێگـەی بەزەیی ☰ ١. بینوا؛ فقیر ٢. شایان ترحُم

**زیڤـاری / zîvarî/:** نـاو. هـەژاری؛ بێچـارەیی ☰ بینوایی

**زیڤاڵ / zîval/:** ☜ **زیڤار[١]**

**زیڤان / zîvan/:** نـاو. زیوان؛ دنێب؛ دەنکێکی ڕەش

و تاڵە لـە نـاو گەنمـدا 🇮🇷 دانـەای سـیاه و تلـخ در گندمزار

**زیڤـرک** / zîvrik ,zîvirk/: نـاو. ١. خڕکەبـــەرد؛ چەوی پڕی مشت ٢. جۆرێ کفتەی بێناوەڕۆک 🇮🇷 ١. قلوەسنگ ٢. نوعی کوفتەی سادە

**زیڤزیڤ** / zîvzîv/: ☜ **زیور**

**زیڤزیڤە** / zîvzîve/: ☜ **زیور**

**زیڤنتار** / zîvintar/: ☜ **زێڕەوشان**

**زیڤە** / zîve/: ☜ **زیور**

**زیڤینگ** / zîvîng/: ناو. ئەشکەوتێ کە خەڵکی تیا ئەژی 🇮🇷 غار مسکونی

**زیق**[١] / zîq/: ناو. ١. زیڕە بە دەنگی تیـژ ٢. هـەناو؛ ناو زگ ٣. هەوا و کێم؛ چڵکی برین و کوان 🇮🇷 ١. جیغ ٢. احشاء ٣. چرک زخم و دُمل

**زیق**[٢]: ناوەڵناو. ١. زبر؛ زوور ٢. زۆپ و زەق ٣. قیت و بەل ٤. ☜ **زیل[٢]-٢** 🇮🇷 ١. زِبر ٢. برآمده ٣. قُد ٤. ☜ **زیل[٢]-٢**

◘ **زیق دەرهاتن**: ١. بـە هـۆی گوشـارەوە نـاوزگ دەرهاتن ‹جووجەڵەکە زیقی دەرهات› ٢. *[کینایە]* لـە ژێـر گوشـاری زۆردا بـوون ‹لـە بەیانییـەوە خـەریکم، زیقـم دەرهـات›. هـەروەها: **زیـق دەرهێنان/ دەرهاوردن** 🇮🇷 ١. احشاء درآمدن ٢. زیر فشار بودن

**زیق کردن**: تۆقین؛ زاڵەترەک بوون 🇮🇷 زهرەتـرک شدن

**زیق**[٣]: دەنگەناو. زیقـە؛ دەنگـی گریـانی منـاڵ 🇮🇷 صدای گریەی بچە

**زیقانـدن** / zîqandin/: چـاوگ. تێنەپـەڕ. //زیقانـدت؛ دەزیقێنی؛ بزیقێنە// زیقانن؛ زیڕاندن بە دەنگی تیژ 🇮🇷 جیغ کشیدن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەزیقاندن

**زیقانن** / zîqanin/: ☜ **زیقاندن**

**زیقاولە** / zîqawle/: ☜ **زیقاوە**

**زیقاولەشامی** / zîqawleşamî/: ☜ **زیقاوە**

**زیقاوڵ** / zîqawił/: ☜ **زیقن**

**زیقاوڵە**[١] / zîqawłe/: ناو. ١. جانەوەرێکە لە ڕێوی پچووکتر، کەوڵـی بەنرخـە ٢. ☜ **زیقـاوە** 🇮🇷 ١. جانوری از تیـرەی روبـاه بـا پوسـت قیمتـی ٢. ☜ زیقاوە

**زیقاوڵە**[٢]: ☜ **زیقن**

**زیقـاوە** / zîqawe/: نـاو. زیرزیقاوڵـــە؛ زیرقاوڵـــە؛ زیقاوڵـە؛ زیقاولەشـامی؛ زیقاوڵـە؛ زیـق‌زیقـاوە؛ زیـق‌زیقـە؛ زیقوڵـە؛ جیقۆڵـە؛ داڵداڵەکۆسـەـ؛ داوداوەکۆســتە؛ داوداوەکۆســە؛ داوەکۆسـتە؛ قی‌قی‌داوکە؛ کەڵەشێری مـەرزە؛ باڵـندەیەکە لـە تۆرەمەی ڕەوڕەوە، نزیـک ٣٠ سـانتی‌میتـرە، بـە پشتی ڕەشی ئاماڵ شین، بەرزگی سـپی، پـەڕ و باڵی بریقەدار، کاکۆڵی قیـت و درێـژ، لاجانـگ و سەر کلکی بەڵـەکەوە، لـە فڕینـدا ڕاسـت نـاڕوا، هێلکـەی خـاڵ ـ خـاڵ و بـۆرە، ناوەکـەی لـە دەنگەکەی گیراوە، ئەگەر گیاندارێ لە هێلانـەی نزیک بێتەوە، زیقەزیق دەکا و شالاوی بۆ دێنێ و تا دووری نەخاتەوە، لێی نابێتەوە، لە نـاو زەوی و زار، قـەراخ ئـاو و تـەنکاوان دەبینـرێ 🇮🇷 خـروس کولی

**زیق‌زیقاوە** / zîqzîqawe/: ☜ **زیقاوە**

**زیق‌زیقە** / zîqzîqe/: ☜ **زیقاوە**

**زیقن** / zîqin/: ناوەڵناو. *[پلار]* زیقـاوڵ؛ زیقاوڵـە: ١. لاوازی پیس ٢. جیقن؛ گرینۆک؛ میزن؛ زرـ زرۆ؛ گرینۆکی پەڵپ‌گر 🇮🇷 ١. لاغر کثیف ٢. زرـ زرو

**زیقنای** / zîqnay/: چاوگ. زیقاندن 🇮🇷 جیغ کشیدن

**زیقوزەر** / zîquzer/: ناو. حەقلی‌مـەقۆ؛ حینـدرحۆ؛ هەلەق ـ مەلەق 🇮🇷 الاکلنگ

**زیقوله** / zîqule/: ☜ **زیقاوە**

**زیـق‌وواق** / zîq û waq/: نـاو. قیـژ و واژ؛ زاک و زووک 🇮🇷 زاغ و زوغ

**زیق‌وهۆڕ / zîq û hoř/**: ناو. زیڕەزیڕ ☰ جیغ و داد

**زیقە / zîqe/**: دەنگەناو. زریکە ☰ زر

**زیقەزیق / zîqezîq/**: دەنگەناو. زیڕەزیڕ بە دەنگی تیژ ☰ جیغ و داد

**زیقەزیقکەر / zîqzîqker/**: ئاوەڵناو. قاڕقاڕۆ ☰ جیغ جیغو

**زیقەنە / zîqene/**: ☜ زەنی

**زیک¹ / zîk/**: ناو. گشتەکی مۆم لێ دراو ☰ رشتەی موم کشیده

**زیک²**: ئاوەڵناو. ۱. گرژ (موو) ۲. باریک؛ ناسک (دەنگ) ۳. زۆر سارد ٤. زەق؛ زۆپ ٥. ☜ زیل²-۲ ☰ ۱. سیخ (مو) ۲. نازک؛ زیر (صدا) ۳. بسیار سرد ۴. برآمده ۵. ☜ زیل²-۲

**زیکاندن / zîkandin/**: ☜ زریکاندن

**زیکانن / zîkanin/**: ☜ زریکاندن

**زیکر / zîkr/**: ناو. ۱. ویرد؛ نزای لە بن لێوانەوە ۲. زکر؛ کۆڕی دەرویشان بۆ جەزم بوون. هەروەها: **زیکر کردن** ☰ ۱. ذکر ۲. اجتماع درویشان برای ذکر

**زیکل / zîkil/**: ئاوەڵناو. زرنگ؛ وشیار ☰ زرنگ

**زیکن / zîkin/**: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی منالێ کە زۆر ئەزیقنێ ☰ جیغ ـ جیغو

**زیکنای / zîknay/**: چاوگ. زریکاندن ☰ جیغ کشیدن

**زیکە / zîke/**: ناو. ۱. ☜ زریکە ۲. دەنگی ناسک و باریک ☰ ۱. ☜ زریکە ۲. صدای نازک و زیر

**زیکەزیک / zîkezîk/**: دەنگەناو. ۱. زریکەی زۆر ۲. دەنگی تیژ و باریک ☰ ۱. جیغ زیاد ۲. صدای زیر

**زیگار / zîgar/**: ناو. شەونشینی؛ شەویاری؛ شەڤبۆری؛ میوانی شەوانە ☰ شب‌نشینی

**زیگزاگ / zîgzag/**: ناو. لابەلا؛ لاپلا؛ لارە؛ لاوەلا؛ خلێوخاو؛ گامێزرێگە؛ میزەگایلە؛ قەمچوپێچ؛ ڕێگە یان هێڵێکی نارێکی ددانەداری لە دووی یەک (لە بیچمی حەوت و هەشت) ☰ زیگزاگ

**زیگوورات / zîgûrat/**: ناو. جۆرێ خانووبەرەی کەونارای چەند نهۆمی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بە شێوەی هیرەمی چوارسووچ و پلەپلە ☰ زیگورات

**زیل¹ / zîl/**: ناو. ۱. زرنە؛ زەنگ؛ زەنگۆڵەی خەبەردان ۲. چەکەرە؛ چرۆ؛ چووزە؛ لقی ناسکی دار و گیا کە تازە سەری هەڵدابێ ۳. زمانەچکۆلە ٤. قامیشی حەسیری بۆریا ٥. پیری بەهێز و تاقەت ٦. بەلووکە؛ میتکە؛ چووچەلە ۷. ☜ ژیر¹-۱و۲ ☰ ۱. زنگ اخبار ۲. جوانه؛ نیش گیاه ۳. زبان کوچک ۴. نی حصیری ۵. پیرمرد توانا ۶. چوچوله ۷. ☜ ژیر¹-۱و۲

**زیل²**: ئاوەڵناو. ۱. ڕیز؛ ڕێز؛ ورد؛ وردیلە ۲. زیڕ؛ زیق؛ زیک؛ زیلە؛ زیڵ؛ باریک و تیژ (بۆ دەنگ بە فریکانسی زۆرەوە) ‹ئەی گوێ! زەلیلی چاوم و بەر تۆ پەنا ئەبەم/ دەنگێ لە یاری دوورەوە، چی بکەم لە زیل و بەم؟ «گۆران»› ☰ ۱. ریز ۲. زیر (برای صدا)

**زیلان / zîlan/**: ناو. گرێژنەی درگا ☰ پاشنەی در

**زیلک / zîlik/**: ناو. ۱. نێرگزە؛ میتکەی یەکسمی مێوینە ۲. چەکەرە ۳. ژیلەمۆ؛ وردەئاگری ناو خۆڵەمێش ٤. کیسەی زراو ☰ ۱. برجستگی فرج ستور ۲. سبزەی تازە سر برآورده ۳. مُختصر آتش زیر خاکستر ۴. کیسەی صفرا

▣ **زیلک ڕژان**: زراو تۆقین؛ زراو چوون ☰ زهره‌ترک شدن

**زیللە / zîlle/**: ☜ زللە -۱

**زیلۆ / zîlo/**: ناو. ۱. پەلاسی لە دەزووی لۆکە ۲. ژێرەخەر؛ ڕایەخ؛ هەر جۆرە ڕاخەرێ بۆ لە سەر دانیشتن ☰ ۱. زیلو؛ فرش نخی ۲. زیرانداز

**زیلە¹ / zîle/**: ناو. ۱. ☜ زللە -۱ ۲. زیندەوەری چکۆلە ۳. ژیلەمۆ؛ زیلەمۆ ٤. مێروو؛ جرۆجانەوەر ☰ ۱. ☜ زللە -۱ ۲. جاندار کوچک ۳. اخگر زیر خاکستر ۴. حشره

**زیله**[٢]: ☜ **زیل**[٢]**ـ٢**

**زیلەمۆ / zîlemo/**: ☜ **ژیلەمۆ**

**زیڵ / zîł/**: ☜ **زیل**[٢]**ـ٢**

**زیڵو / zîłû/**: ☜ **زیور**

**زین / zîn/**: ناو. مارەکە: ١. کەرەستەیەکی چەرمی وەک پاڵشتێکی نێو چاڵ، بە تەنگە و مامزەوە، کە لە کاتی سواریدا دەیخەنە سەر پشتی ئەسپ و بە سەریەوە دادەنیشن ‹زین بۆ ئەسپە و کورتانیش بۆ کەر «مەسەل»› ٢. جێگەی دانیشتن لە سەر دووچەرخە یان موتور ☒ ١و٢. زین

**زینا / zîna/**: ناو. زیناح؛ سەرجێیی ناشەرعی ☒ زِنا

**زینات**[١] **/ zînat/**: ناو. زلم؛ زوڵم؛ ناهەقی ☒ ستم

**زینات**[٢]: ئاوەڵناو. ئازاردەر؛ بەدفەڕ ☒ موذی؛ بدجنس

**زیناتکار / zînatkar/**: ئاوەڵناو. زاڵم؛ ناحەقیکار ☒ ستمکار

**زیناح / zînaĥ/**: ☜ **زینا**

**زیناکار / zînakar/**: ئاوەڵناو. سەرجێییکەری ناشەرعی ☒ زناکار

**زینان / zînan/**: ☜ **زیندان**

**زینانوان / zînanwan/**: ☜ **زیندانەوان**

**زینانەوان / zînanewan/**: ☜ **زیندانەوان**

**زینپۆش / zînpoş/**: ناو. سەرجلی زین؛ پارچەیەک کە بە سەر زیندا دەگیرێ ☒ پارچەی روی زین

**زینچ / zînç/**: ☜ **زەنی**

**زینچک / zînçik/**: ☜ **زنچك**

**زینچکاو / zînç(i)kaw/**: ☜ **زنچکاو**

**زینچێکەر / zînçêker/**: ☜ **زینوەشکەر**

**زیندان / zîndan/**: ناو. زندان؛ زینان: ١. بەندیخانە؛ گرتووخانە ‹من ئەو دیلەم لە زیندانی تاریکا/ هەتاوی بیر ڕووناک ئەکا بەرچاوم «گۆران»› ٢. شوێنێ کە کەسێ تێیدا گیر دەخوا و هاتنە دەرەوەی بۆ نییە ☒ ١و٢. زندان

**زیندانوان / zîndanwan/**: ☜ **زیندانەوان**

**زیندانەوان / zîndanewan/**: ناو. زینانەوان؛ زینانوان؛ زیندانوان؛ بەندیوان؛ چاوەدێر یا کارگێڕی بەندیخانە ☒ زندانبان

**زیندانی / zîndanî/**: ناو. بەندی؛ لە بەند کراو ☒ زندانی

◘ **زیندانی بون**: ١. بەند کران ٢. لە شوێنێک گیر خواردن ☒ ١و ٢. زندانی شدن

**زیندرو / zînd(i)rû/**: ناو. زیندوور؛ کەسێ کە زین دروست دەکا ☒ سرّاج

**زیندک / zîndik/**: ☜ **زیندو**[٢]

**زیندگ / zîndig/**: ☜ **زیندو**[٢]

**زیندو**[١] **/ zîndû/**: ناو. زینی: ١. *[کینایە]* سپێ و کێچ لە لەشی بنیادەمدا ٢. بستوو؛ ملەی کێو ☒ ١. شپش و کک در لباس ٢. گردنەی کوە

**زیندو**[٢]: ئاوەڵناو. زندوو؛ زنوو؛ زنە؛ زنە؛ زنی؛ زەن؛ زیندک؛ زیندگ؛ زیندی؛ زینگ؛ زینوو؛ زینە؛ زینی: ١. ژیاندار؛ زیندەوار؛ زیندەماڵ؛ زیندەوەر؛ بەهرەوەر لە ژیان ‹ماسی زیندوو› ٢. زیندەوار؛ زیندەماڵ؛ زیندەوەر؛ بە جمۆجووڵێ کە لە بوونی گیانەوەران تێیدا دەوەشێتەوە ‹شاری زیندوو› ٣. بە گوڕ و گەشە ‹هێزی زیندوو› ☒ ١تا٣. زنده

◘ **زیندو بونەوە**: ١. وشیار بوونەوە؛ وریا بوونەوە؛ بە دەست هێنانی دووبارەی ژیان ‹سێ سەعات دوای مردنی، بینیان کە زیندوو بۆتەوە و خەریکە هەناسە دەدا› ٢. ژووژانەوە؛ ژووژیانەوە؛ بووژانەوە؛ ئەوەژیوەی؛ ژیوایەوە؛ کەوتنە خۆ؛ بە دەست هێنانی دووبارەی سەلامەت، پاراوی یان چالاکی خۆ ‹دەشت بە

بـارانی بـەهاری زینـدوو بـووەوە› * هـەروەها: **زیندوو کردنەوە** ▇ ١. دوباره زنده شدن ٢. جـان گرفتن

**زیندوور** / zîndûr/: ☜ **زیندرو**

**زیندولـە** / zîndûle/: نـاو. خـوزرە؛ میکـرۆب ▇ میکرُب

**زیندەبـەتاڵ** / zîndebetał/: ئاوەڵـناو. خوێـڕی؛ بێکار و بەرەڵلا ▇ لات و لاابالی

**زیندەبەچاڵ** / zîndebeçał/: ☜ **زیندەبەگۆڕ**

**زیندەبەگۆڕ** / zîndebegoř/: ئاوەڵناو. زیندەبەچاڵ؛ زینگـەچاڵ؛ زنگـەچاڵ؛ بـە زینـدویی نێـژراو. هەروەها: **زیندەبەگۆڕ بوون/ کردن** ▇ زندەبگور

**زیندەخـەو** / zîndexew/: نـاو. بیرەخـەو؛ کـار و ڕەوتی لە فکر ڕاچوون بە جۆرێ کە هۆشی لە لا نەمێنێ ▇ عمل در فکر عمیق فرورفتن

**زیندەزێ** / zîndezê/: ئاوەڵـناو. تایبەتمەندی هـەر گیانلەبـەرێ کـە لـە جیـاتی هێلکـە کـردن - پێچەوانەی تۆرەمەی خۆی - بەچکـەی دەبێـت ▇ زندەزا

**زیندەگی** / zîndegî/: ناو. زنـەگی؛ زنـەیی؛ زیـوار؛ ڕەوتی ڕابواردنی تەمەن ▇ زندگی

**زیندەماڵ** / zîndemał/: ☜ **زیندەوار-١**

**زینـدەوار** / zîndewar/: نـاو. زینـــدەوەر: ١. زیندەماڵ؛ زینەماڵ؛ ئاژەڵ و ماڵات ٢. گیانەوەر ‹سکووتێکی بەسام سەرتاسەری ئەم دێیە دادەگرێ/ دەڵێی هەر زیندەوارێکی هەیە لەو دێیـەدا دەمـرێ «هێمن»› ▇ ١. احشام؛ دام ٢. جاندار

**زیندەوەر** / zîndewer/: **زیندەوار**

**زیندەوەرناسی** / zîndewernasî/: ناو. ژیـن‌ناسـی؛ زینەوەرناسی ▇ زیست‌شناسی

**زیندی** / zîndî/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **زینـدوو**[٢] ٢. ☜ **زندی -٢**

**زینـدی‌خۆر** / zîndîxor/: ئاوەڵـناو. ١. مرۆخـۆر ٢. *[کنایە]* خوێنمژ و زاڵم ▇ ١. آدم‌خوار ٢. ستمکار

**زیندی‌سـەر** / zîndîser/: ئاوەڵـناو. زینـــدوو؛ بـــە زیندوویی ▇ زنده

**زینک** / zînk/: ناو. پلەت؛ پەڕەی کـانزایی، زۆرتـر لە جنسی ڕۆح، کە لە چاپی ئۆفسـێتدا بـە کـار دێت ▇ زینک

**زینکۆ** / zînko/: نـاو. قەڵپووز؛ کەڵبەزین؛ بـەرکۆ؛ لووتکەی پێشی زین ▇ قاچ زین

**زینگ** / zînig/: ☜ **زیندوو**[٢]

**زینگانی** / zînganî/: ناو. زنانی؛ زینگـی؛ ژیـان ▇ زندگانی

**زینگلـە** / zîng(i)le/: نـاو. تلیســک؛ تیســک؛ زەنگەتە ترێ ▇ تلسک

**زینگەچاڵ** / zîngeçał/: ☜ **زیندەبەگۆڕ**

**زینگی** / zingî/: ☜ **زینگانی**

**زینگی‌نامە** / zingîname/: ناو. ژیاننامـە؛ ژیننامـە ▇ زندگینامه

**زین‌وبـەرگ** / zîn û berg/: نـاو. زیـن‌وتـاقم‌زیـن؛ کەڵ‌وپەلی زین ▇ زین‌وبرگ

**زین‌وتـــاقم‌زین** / zîn û taqimzîn/: ☜ **زین‌وبەرگ**

**زین‌وەشکەر** / zînweşker/: نـاو. زیـن‌چێکـەر ▇ سراج

**زینوی** / zînwî/: ناو. ژینگە؛ مەڵبەند ▇ زیستگاه

**زینوو**[١] / zînû/: ناو. زینی؛ ملەی کێـو؛ بسـتوو ▇ گردنەی کوه

**زینوو**[٢]: ☜ **زیندوو**[٢]

**زینـە**[١] / zîne/: نـاو. ١. زییـە؛ زێ؛ دڕکـەدزی ٢. ژن؛ ئافرەت ▇ ١. نوعی خاربُن ٢. زن

**زینە**[٢]: ☜ **زیندوو**[٢]

**زینەماڵ** / zînemał/: ☜ **زیندەوار-١**

**زینەوەرناسی** / zînewernasî/: ☜ **زیندەوەرناسی**

**زینـی**[١] / zînî/: نـاو. ١. ☜ **زینـوو**[١] ٢. گـوێزان؛

تیخی موو تاشین ☜ ١. ☜ **زینو**[1] ٢. استره؛ تیغ موتراش

**زینی**[2]: ☜ **زیندو**[2]

**زیو**[1] / zîw/: ناو. ١. ☜ **زیو-١** ٢. جیوه؛ زاوق؛ ژووڤه؛ توخمی کیمیایی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ٨٠ و کێشی ئەتومی ٢٠٠,٥٩، کە لە دەمای ئاساییدا تراوە و ڕەنگی لە زیو دەکا ☜ ١. ☜ **زیو-١** ٢. جیوه

**زیو**[2]: دەنگ. زیوە؛ دەنگی بەچکەمەلی بچکۆلە ☜ صدای جوجەی پرندە

**زیوا** / zîwa/: ☜ **زەمەق**

**زیوار** / zîwar/: ☜ **زیندەگی**

**زیوارە** / zîware/: ناو. ئێوارە ☜ هنگام عصر

**زیواڵ** / zîwał/: ناو. تیتۆڵ؛ تیتاڵ؛ بزگوڕ ☜ تراشە و پُرز لباس کهنه

**زیواڵ ـ زیواڵ** / zîwał zîwał/: ئاوەڵناو. دڕاو و لە بەر یەک هەڵوەشاو ☜ پارە ـ پورە

**زیوان**[1] / zîwan/: چاوگ. بزوان ☜ تکان خوردن

**زیوان**[2]: ناو. ١. ☜ **زیڤان** ٢. بزاو؛ جمشت ٣. کون لە مەشکەدا ☜ ١. ☜ **زیڤان** ٢. جُنبش؛ تکان ٣. سوارخ در مَشک

**زیوانن** / zîwanin/: چاوگ. بزواندن؛ تەکاندن ☜ جنبانیدن؛ تکاندن

**زیور** / zîwir/: ناو. زۆڤ؛ زیڤە؛ زیڤزیڤە؛ زیڤزیڤ؛ زێلوو؛ زێلوو؛ زیلۆ؛ زیلوو؛ هەزارپێ؛ هەزارپا ☜ هزارپا

**زیوە** / zîwe/: ناو. ١. بزاو؛ بزاڤ؛ جووڵە ٢. ☜ **زیو**[2] ☜ ١. حرکت ٢. ☜ **زیو**[2]

**زیوەزیو** / zîwezîw/: دەنگەناو. جیکە ـ جیکی جووچکەمەلان پێکەوە ☜ جیک ـ جیک جوجەها

**زیویان** / zîwyan/: چاوگ. جووڵان؛ بزوان ☜ تکان خوردن

**زیوین** / zîwîn/: ئاوەڵناو. ١. لە زیو چێکراو ٢. زیوسان؛ لە گوێنی زیو ☜ ١و٢. نقرەای

**زیەر** / z(i)yer/: ناو. دەم؛ دم؛ زار ☜ دهان

**زیەلە** / z(i)yele/: ناو. زیلک؛ کیسەی زراو ☜ کیسەی صفرا

**زیەڵ** / z(i)yeł/: ئاوەڵناو. تاڵ؛ تەحل ☜ تلخ

**زیەڵگ** / z(i)yełig/: ☜ **زیەڵی**

**زیەڵە** / z(i)yełe/: ☜ **زیەڵی**

**زیەڵی** / z(i)yełî/: ناو. ترس؛ زیەڵە؛ زوویەڵە؛ زیەڵگ ☜ ترس

**زیەم** / z(i)yem/: ☜ **زام**

**زییە** / zîye/: ☜ **زینە**[1]**-١**

**زێ**[1] / zê/: ناو. ١. ڕەوشت؛ ئاکار ٢. پلە و پایە ٣. ناوی پیتی سێزدەهەمی ئەلفوبێتکەی کوردی ٤. ڕووبار؛ چۆمی گەورە ‹هەوەڵ مەنزڵی زێیە، ئاواتی بەرزی زرێیە «سوارە»› ٥. ☜ **زەریا** ٦. ☜ **زریشک** ٧. کوز؛ شەرمی مێوینە ٨. شریتێ کە بۆ جوانی، ڕاگرتن یان پاراستنی شتێ، پێوە دەبەستن ☜ ١. منش ٢. مقام؛ مرتبە ٣. نام حرف سیزدهم الفبای زبان کُردی ۴. زاب؛ رود بزرگ ۵. ☜ **زەریا** ۶ ☜ **زریشک** ۷. کُس ۸ زه

**ـ زێ**[2]: پاشەوشە. بەرهەمی زان ‹زستانەزێ؛ هاوینەزێ› ☜ ـ زاد

**زێبا** / zêba/: ☜ **زیبا**

**زێبار** / zêbar/: ناو. کنارێن؛ بەستێن؛ زرێوار؛ سەر لێواری دەریا ☜ ساحل دریا

**زێباز** / zêbaz/: ناو. مەلەوان ☜ ملوان

**زێچ** / zêç/: ناو. ١. فرچک؛ هەوەڵشیر ٢. گالۆن؛ پووتی ئەستوور ☜ ١. آغوز ٢. پیت کُلُفت

**زێخەڵان** / zêxełan/: ناو. خێزەڵان ☜ شنزار

**زێد** / zêd/: ناو. ١. ☜ **زاگە -١** ٢. نیشتمان؛ وەتەن ‹دێم ببینم نیشتمان و زێدەکەم/ دێم ببینم خزم و کاک و دیدەکەم «هێمن»› ٣. گۆڕ؛ قەبر ☜ ١. ☜ **زاگە-١** ٢. میهن ٣. قبر

**زێدان / zêdan/:** ناو. بەچەدان؛ پرزانگ ☰ زهدان

**زێدپەرست / zêdperist/:** ناو. ولاتپاریز؛ ولاتپەرست ☰ وطن‌پرست

**زێدە / zêde/:** ئاوەلناو. ١. زۆر؛ زاف ٢. زیادە؛ یەکجار زۆر ‹بە کوردی، شایەریکی زێدە چاکم/ لە شاباشی سەخای خوت مەمکە بێ‌بەش! «سەیفولقوزات»› ☰ ١. بسیار ٢. بیش از حد

**زێدەبار / zêdebar/:** ناو. مزۆدک؛ نێوبار؛ سەربار ☰ اضافه‌بار

**زێدەپارو / zêdeparû/:** ناو. پاروەوە خۆراکی زیادی بۆ قەڵەو بوون ☰ لقمەی اضافه برای چاق شدن

**زێدەڕۆیی / zêdeřoyî/:** ☜ **زیاڕەوی**

**زێدەگاوی / zêdegawî/:** ناو. دەستدرێژی؛ دەسدرێژی ☰ تجاوز

**زێدەوان / zêdewan/:** ☜ **زێوان**

**زێدەیی / zêdeyî/:** ناو. زافی؛ زۆری؛ فرەیی ☰ فراوانی

**زێر / zêr/:** ☜ **زبر**

**زێراب / zêrab/:** ☜ **زێراو**

**زێراو / zêraw/:** ناو. زێراب؛ ڕەهەندی ئاوی پیس ☰ مجرای فاضلاب

**زێرق / zêriq/:** ☜ **زاروـ١**

**زێرگەوان / zêrgewan/:** ☜ **زێوان**

**زێرو / zêrû/:** ☜ **زاروـ١**

**زێرەڤان / zêrevan/:** ☜ **زیرەڤان**

**زێرەڤانی / zêrevanî/:** ناو. پاس؛ ئاگاداری ☰ پاس

**زێرەوان / zêrewan/:** ☜ **زیرەڤان**

**زێڕ / zêř/:** ناو. زەڕ؛ ئاڵتوون؛ تەلا؛ تلا؛ تەلێ؛ ئاتی: ١. توخمێکی کیمیایی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ٧٩ و کێشی ئەتومی ١٩٦،٩٦ بە ڕەنگی زەردی درەوشاوە، چەکوشخۆر و دژ بە ژەنگ بۆ سکە لێدان، جەواهێرسازی، دەواسازی و هەروەها لە ئامێرە ئەلەکتریکییەکاندا بە کار دێ ٢. هەر چەشنە بەرهەمێکی لە زێڕ دروستکراو ٣. *[مەجاز]* شتی زۆر بەنرخ ٤. *[کۆن]* دراوی زێڕ ☰ ١و ٢. طلا ٣. هر شیئ باارزش ۴. سکەی زر

▣ **زێڕی ڕەش:** *[مەجاز]* نەوت؛ نەفت ☰ نفت

**زێڕی سپی:** ١. پلاتین ٢. *[مەجاز]* لۆکە؛ پەمۆ ☰ ١. پلاتین ٢. پنبه

**زێڕباخن / zêřbaxin/:** ☜ **زێڕکفت[٢]ـ١**

**زێڕباف / zêřbaf/:** ئاوەلناو. زێڕبافت؛ زەڕی؛ چنراوەیەک کە تاڵی زێڕینی تێدا دەکار کرابێ ☰ زربافت

**زێڕبافت / zêřbaft/:** ☜ **زێڕباف**

**زێڕدۆز / zêřdoz/:** ☜ **زەڕکەش**

**زێڕکار / zêřkar/:** ☜ **زێڕینگەر**

**زێڕکڕ / zêřkiř/:** ☜ **زەڕخرید**

**زێڕکفت[١] / zêřkift/:** ناو. زەڕکفت؛ ڕەنگی زەردی ئاڵتوونی ☰ رنگ طلایی

**زێڕکفت[٢]:** ئاوەلناو. زەڕکفت: ١. زێڕباخن؛ زەڕکەش؛ تەلاکفت؛ ئاوەزێڕ؛ ئاڵدوز؛ میتەلا؛ متەلا؛ بە ئاوەزێڕ سواخدراو ٢. زێڕکوت؛ زێڕنەخش؛ زێڕنووس؛ بە بەرگی نەخشاو، یان نووسراو بە ڕەنگی کانزایی بریقەدارەوە ☰ ١و٢. زرکوب

**زێڕکوت / zêřkut/:** ☜ **زێڕکفت[٢]ـ٢**

**زێڕگۆن / zêřgon/:** ناو. کاروانکوژە؛ کاروانکوژ ☰ ستارەی سحری

**زێڕگەر / zêřger/:** ☜ **زێڕینگەر**

**زێڕن / zêřin/:** ئاوەلناو. ١. ☜ **زێڕین ـ١** ٢. لە گوین زێڕ لە ڕەنگا ☰ ١. ☜ **زێڕین ـ١** ٢. طلایی رنگ

**زێڕناس / zêřnas/:** ☜ **زەڕناس ـ١**

**زێڕنگەر / zeřinger/:** ☜ **زێڕینگەر**

**زێڕنووس** / zêřnûs/: ☜ **زێڕکفت[٢]-٢**

**زێڕنەخش** / zêřnexş/: ☜ **زێڕکفت[٢]-٢**

**زێڕوزەمبەر** / zêř û zember/: ناو. خشڵ و زەمبەر؛ ڕەوش؛ شتی ڕازێنەیی و مت‌ومووروویی جۆراوجۆر کە بۆ زێدە کردنی جوانی و شکۆ کەڵکی لێ وەردەگرن ☰ زیب‌وزیور

**زێڕەوشان** / zêřweşan/: ☜ **زێڕەوشان**

**زێڕەڤان** / zêřevan/: ☜ **زیرەڤان**

**زێڕەوشان** / zêřewşan/: ناو. زیڤن‌تار؛ زێڕووشان؛ کاری پارە بە سەر بووکدا هەڵاویشتن ‹بکەن ئێستا سەراپا زێڕەوشانی/ خەڵاتی گەورەیی دادەن بە شانی «هێمن»› ☰ زرافشانی

**زێڕین** / zêřîn/: ئاوەڵناو. زەڕین؛ تەلایی: ١. زێڕن؛ دروستکراو لە زێڕ ٢. بە ڕەنگی زەردی درەوشاوە ٣. *[مەجاز]* زۆر بەرکەتی و پڕبایەخ ‹هەلی زێڕین› ☰ ١تا٣. طلایی

**زێڕینگەر** / zêřînger/: ناو. زێڕکار؛ زێڕگەر؛ زەڕینگەر؛ زێڕنگەر؛ زەڕگەر؛ ئاڵتوونچی؛ پیشەسازێ کە بە زێڕ و بەردی بە نرخی‌تر خشڵ و کەرەسەی جوان و ڕازێنەر دروست دەکا ‹ناوا دەبێ وەرگێڕانەوە و وەرگێڕ/ هەر زێڕینگەر دەبێ بگرێ قەدری زێڕ «حەقیقی»›. هەروەها: **زێڕینگەری** ☰ زرگر

**زێسان** / zêsan/: ☜ **زەیسان**

**زێقنای** / zêqnay/: چاوگ. زیقاندن ☰ جیغ کشیدن

**زێلاقە** / zêlaqe/: ناو. لیتە؛ قوڕ و چڵپاو ☰ گل و لای

**زێلک** / zêlik/: ناو. کرانتی؛ زەرداو؛ زەرتاڵ ☰ صفرا

**زێلو** / zêlû/: ☜ **زیور**

**زێڵ** / zêł/: ناو. دڵ ☰ قلب

**زێڵۆ** / zêło/: ☜ **زیور**

**زێڵو** / zêłû/: ناو. ١. ☜ **زیور** ٢. ☜ **زارو-١**

**زێڵوولک** / zêł û wiłk/: ناو. گیان‌ودڵ؛ دڵ‌وگیان ☰ جان‌ودل

**زێمار** / zêmar/: ئاوەڵناو. زامدار؛ بریندار ☰ زخمی

**زێو** / zêw/: ناو. ١. زیڤ؛ زیو؛ تورمە؛ نوقرە؛ توخمی کیمیایی کانزایی بە ژمارەی ئەتومی ٤٧ و کێشی ئەتومی ١٠٧,٨٦، سپی و بریقەدار، چەماندنی و چەکوشخۆر، لە جەواهیرسازی، ددان‌بژیشکی، دەواسازی و وێنەگریدا کەڵکی زۆرە ٢. بانگێشتنی بە کۆمەڵ ☰ ١. نقره ٢. مهمانی همگانی

**زێوار** / zêwar/: ناو. زەوارە؛ چوارچێوە؛ زێوارە؛ شریتە یا هۆندراوێکی باریک کە بۆ ڕازاندنەوە یان پتەوکاری قەراخەکانی شتێکی پێ دەگرن ☰ زهوار

▣ **زێوار گرتن**: پەراوێز لێ نان ☰ حاشیه دوختن

**زێوارە** / zêware/: ☜ **زێوار**

**زێوان** / zêwan/: ناو. زێوەوان؛ زێدەوان؛ زێرگەوان؛ ئاگاداری گۆڕستان ☰ نگهبان گورستان

**زێ‌وزا** / zê w za/: ☜ **زاوزێ**

**زێ‌وزوو** / zê w zû/: ☜ **زاوزێ**

**زێوکفت** / zêwkift/: ئاوەڵناو. ١. بە زێو سواغدراو ٢. ڕەنگی وەک زێو لێ دراو ☰ ١. سیم‌اندود ٢. نقره‌ای؛ به رنگ نقره

**زێوە** / zêwe/: ناو. قسن؛ خزن؛ چاک؛ چاک و پیر؛ زیارەتگە؛ گۆڕی چاکان؛ شوێنێ کە کۆمەڵێک بە پیرۆزی دەزانن و دەچنە سەری ☰ زیارتگاه

**زێوەر** / zêwer/: ناو. خشڵ؛ خەمڵ؛ زەمبەر؛ ڕەوش ‹بە کاری چی دێ خشڵ و زێڕ و زێوەر/ کچێکی نەشتە نێو خەلک و جەماوەر «هێمن»› ☰ زیور

**زێوەکەو** / zêwekew/: ناو. پۆڕ ☰ دُرّاج

**زێوەوان** / zêwewan/: ☜ **زێوان**

**زێوین** / zêwîn/: ئاوەڵناو. نوقرەیی: ١. چێکراو لە زێو ٢. بە ڕەنگی زێو ☰ نقره‌ای: ١. از جنس نقره ٢. به رنگ نقره

**زێیی** / zêyî/: ☜ **زایی**

# ژ

**ژ / j/**: پیت. نیشانەی چواردەهەمین پیتی ئەلفبای زمانی کوردی ≡ ژ؛ نشانەی حرف چهاردهم الفبای زبان کُردی

**ژ[١] / ji/**: ناو. پیتی چواردەهەمینی ئەلفوبێی زمانی کوردی ≡ ژ؛ چهاردهمین حرف الفبای کردی

**ژ[٢]**: ئامراز. ١. جە؛ دە؛ د؛ لە ‹جلکێ ژ خۆ کە!› ٢. بە؛ وە ‹مە ژ تەدا گوت› ≡ ١. از ٢. بە

**ژا[١] / ja/**: ناو. کاوێژ؛ قاویش؛ کاری هێنانەوەی پەڵخور و جاوەینەوەی ≡ نشخوار

**ژا[٢]**: ئاوەڵکار. ژای: ١. لەوێ؛ لەینە ٢. لەوێوە؛ لەینەوە ≡ ١. آنجا ٢. از آنجا

**ژا[٣]**: ئامراز. یا؛ یان؛ ژای ≡ یا

**ژابێژ / jabêj/**: ناو. بۆژانە؛ بۆگلەوکەشی؛ بوومااران ≡ بومادران

**ژاحرین / jaĥr(i)în/**: ☜ **ژەحرین**

**ژار[١] / jar/**: ناو. زەهر؛ ژەهر؛ ژیەر؛ ژەحر؛ ژەر؛ ژاڵ؛ ژاعر؛ ژیەهر؛ سام؛ تاتیلە؛ زەقەڵتە؛ ژقلتە؛ ژقەڵتە؛ جەحر؛ زل؛ مەرگە؛ هەرکام لەو ماکانەی کە لە برێ گیانەوەر و گیادا بەرهەم دێت و زۆرتر بە کاردانەوەیەکی کیمیایی لە لەشی گیاندارێکیتردا دەبێتە هۆی مەرگ یان ژاراوی بوونی ‹هەزار جامێ جە شەربەت ئەر بنۆشمێ/ جە ئاخر ژار و مەرگیمان قەتاڵا «سەیدی»› ≡ زهر

▣ **ژاری مار**: زەهرەمار؛ ژاری هەلایل؛ قوزەڵقورت: ١. نوێنەی تاڵی و ناخۆشی ‹دەرمانێکیان پێ داوم وەک ژاری مار!› ٢. دەردی بێ دەرمان؛ وەکوو جنێو یان تووکێک دەگوترێ ‹ئەو کەسەی بێکەس نییە و خانەخەراب/ دەک بە ژاری ماری بێ بادە و شەراب! «هێمن»›. هەروەها: **بە ژاری مار بوون؛ کردنە ژاری مار** ≡ ١و٢. زهر مار

**ژاری هەلایل**: ☜ **ژاری مار**

⊡ **ژار دان**: دەرمانداو/ دەرمانخوارد کردن ≡ مسموم کردن

**ژار[٢]**: ئاوەڵناو. ١. زار؛ نزار؛ نەخۆش؛ لاواز ‹مەودای نەبوو دەردی دڵ ببێژێ/ باری دڵی ژاری هەڵبرێژێ «هەژار، *مەموزین*»› ٢. نەدار؛ بێماڵ؛ دەستەنگ؛ هەژار ٣. هەڵقرچاو؛ تێکترنجاو ≡ ١. زار؛ نزار ٢. بینوا ٣. چروکیده

**ژار[٣]**: پێرۆ. ← **ژەنگوژار**

**ژارئالود / jar'alûd/**: ئاوەڵناو. ژاراوی؛ ژاردار ‹زام ژارئالوود بێدەوا نامێ/ مەزانۆ جەی زام مەوینۆ کامێ «بێسارانی»› ≡ زهرآلود

**ژاراڤ[١] / jarav/**: ☜ **حەفتاو**

**ژاراڤ[٢]**: ☜ **ژاراو[٢]**

**ژارانگەز / jarangez/:** ☜ **ژاراوی ـ٢**

**ژارانگەزی / jarangezî/:** ناو. ژاراویەتی؛ دۆخی ژاراوی بوون ≌ مسمومیّت

**ژاراو[1] / jaraw/:** ناو. ١. ژەهراو؛ زاراو؛ توکسین؛ بەرهەمی ژەهراوی باکتری یا خانەیتر کە بە وەشاندنیان لە لەشی گیانداران، دژەژار دروست دەبێ ٢. ناراو؛ زاراو؛ ژەهراو؛ زەهراو؛ شەربەت یان هەر خواردنەوەیەک کە ژاری تێکەڵ کرابێ ‹میرێکی کوردیان بە جامێک ژاراو بێگیان کردووە «سوارە»› ٣. پاشاو؛ پاشاراو؛ نەشاو؛ ئاوێ کە شتێکی پێ شۆرابێ ≌ ١. زهرابە ٢. زهراب ٣. پساب

**ژاراو[2]:** ئاوەڵناو. ژاراف؛ سلپۆت ≌ نجس

**ژاراودار / jarawdar/:** ئاوەڵناو. خاوەن ژاراو ‹جەی خار دەندان ژاراودار مار/ خاتر نازار ویت مەدەر ئازار «مەولەوی»› ≌ زهراگین

**ژاراوی / jarawî/:** ئاوەڵناو. ژاردار؛ ژەهراوی؛ ژەهردار: ١. تێکەڵ بە زەهر ‹کارگی ژاراوی› ٢. ژارانگەز؛ بە ژار نەخۆش کەوتوو ٣. *[مەجاز]* وە بەر شتێکی خراپ و ناخۆش کەوتوو ‹پێوەندی ژاراوی› ≌ ١. زهرآلود ٢و٣. مسموم

⊡ **ژاراوی بوون:** ژەهراوی بوون؛ ژارانگەز بوون: ١. تێکەڵ بە ژار بوون ‹ئاوەکە ژاراوی بوو› ٢. دەرمانخۆر بوون؛ دەرمانخوارد بوون؛ ژارخۆر بوون ‹سەگەکە ژاراوی بووە› ٣. *[مەجاز]* شێوان؛ تێکدران؛ ناخۆش بوون ‹بە هۆی دزی و گەندەڵییەوە، پێوەندییەکانی نێو کۆمەڵگا، ژاراوی بووە› ✱ هەروەها: **ژاراوی بوونەوە؛ ژاراوی کردن** ≌ ١تا٣. مسموم شدن

**ژاراویەتی / jarawyetî/:** ناو. ژارانگەزی؛ مەسموومیەت؛ دۆخی ژاراوی بوونەوە ‹ژاراویەتی بە ئاوی پیس› ≌ مسمومیت

**ژاربەر / jarber/:** ناو. دەرمانی دژی ژەهر ≌ پادزهر

**ژارخانە / jarxane/:** ناو. جێگەی بەخێو کردنی بێماڵ و حاڵان ≌ نوانخانه

**ژاردار / jardar/:** ☜ **ژاراوی**

**ژارقەندە / jarqende/:** ناو. ژارقەنگە؛ ژارقەننە؛ خڵتەی جگەرە؛ ژەنگ سگار ≌ زنگار سیگار

**ژارقەنگە / jarqenge/:** ☜ **ژارقەندە**

**ژارقەننە / jarqenne/:** ☜ **ژارقەندە**

**ژارک / jar(i)k/:** ناو. ١. ڕەگەکەنگر ٢. پنج و مۆر؛ هەرچی ساڵیتر هەڵداتەوە ≌ ١. ریشەی کنگر ٢. ریشەای کە باز سبز می‌شود

**ژارماسی / jarmasî/:** ناو. ژەهرەماسی؛ گیایەکی گەڵا تووکنی مەیلەو زەردە، گوڵی زەرد دەردەکا و لاسکی قاوەییە، زۆر لە گۆگەم دەچێ، وشکی دەکەن و بە مەڵۆ دەیبەن لە چۆمی دەکەن و بە دار دەیکوتن، تالاوەکەی ماسی دەکوژێ ≌ بذرالقمر

**ژارناسی / jarnasî/:** ناو. زانستێ کە لە سەر ژار و کاریگەری و بابەتی پێوەندیدار بە ژار (کیمیایی و پیشەیی و مافناسی) دەکۆڵێتەوە ≌ زهرشناسی

**ژاروژەنگ[1] / jar û jeng/:** ناو. *[کینایە]* ڕق؛ قین؛ تووڕەیی ‹ڕەشەبا لێمان بە ژاروژەنگە/ گەڵاڕێزانە گوڵ ئاڵتوون ڕەنگە «پیرەمێرد»›. هەروەها: **بە ژاروژەنگ بوون** ≌ کینه

**ژاروژەنگ[2]:** ئاوەڵناو. ١. *[پلار]* دۆخی نەخۆشی لە مردن ‹مامی زۆر نەخۆشە و حاڵی لە ژاروژەنگە، پێم وا نییە بکەوێتە بەهار› ٢. *[کینایە]* بارودۆخی پشێوی و ئاژاوەی ناوخۆ ≌ ١. حالت بیمار مُردنی ٢. شرایط آشوب خانوادگی

**ژاروەردە / jarwerde/:** ئاوەڵناو. ژار خواردوو ‹خۆ جای پەیکانان ژاروەردەکەی تۆ/ تا بەر پەڕەی دل پەی کەردەکەی تۆ «مەولەوی»› ≌ زهرخورده

**ژارۆ / jaro/:** ئاوەڵناو. هەژار؛ بێماڵوحاڵ ≌ بینوا

**ژاری / jarî/**: ناو. ١. فەقیری و نەداری ٢. شـیوەن و ڕۆڕۆ ☰ ١. بینوایی ٢. شیون و زاری

**ژارین / jarîn/**: چاوگ. سکالا کـردن؛ پاڕانـەوە ☰ نیایش کردن

**ژاژ¹ / jaj/**: ناو. ١. زەل؛ چیتک؛ قەمیش؛ قـامیش ٢. چەلاکی مازوو تەکاندن ٣. گیایەکی بۆنخۆشە دەگەڵ پـەنیر و شـیرێژی دەکـەن ☰ ١. نـی ٢. چوب بلند مازوج تکاندن ٣. گیاهی خوشبو که با پنیـر و شیراز آمیزند

**ژاژ²**: ناوەڵـناو. شـلۆق؛ قەرەباڵـغ؛ پڕحەشـامەت ☰ شلوغ

**ژاژک / jajik/**: ناو. ١. ☜ **جاچکە** ٢. خەوەنشکێ؛ باریشک؛ باوێشک ☰ ١. ☜ **جاچکە** ٢. خمیازە

**ژاژکە / jajke/**: ☜ **جاچکە**

**ژاژوپـەڕ / jaj û peř/**: نـاو. ژاژوفـەڕ؛ شـکۆ و پایەبەرزی ‹بولبولی گولزاری کولمی تۆ کە ڕووحـی عاشقە/ کەی خەیالی ژاژوپەڕ یا سۆسـەن و نەسـرین ئەکا؟ «قانع»› ☰ جلال و شکوە

**ژاژوفەڕ / jaj û feř/**: ☜ **ژاژوپەڕ**

**ژاژۆک / jajok/**: ☜ **ژاژەڵان**

**ژاژەڵان / jajełan/**: نــاو. ژاژۆک؛ چیتــەڵان؛ قامیشەڵێن ☰ نیزار

**ژاژی / jajî/**: ناو. سیراج؛ شیرێژ ☰ شیراز

**ژاژیڕۆن / jajî řon/**: ناو. ژاژیڕوون: ١. شـیرێژ و ڕۆن ٢. چێشتێکە دەگەڵ وردە ساوار لێدەنـرێ ☰ ١. کره و کشک ٢. آش شیراز و بلغور

**ژاژی ڕوون / jajî řûn/**: ☜ **ژاژی ڕۆن**

**ژاژیل / jajîl/**: ناوەڵناو. زۆربلێی خاوەخاو قسـەکەر ☰ ژاژخا

**ژاژیلۆک / jajîlok/**: نـاو. ڕوەکێکـە لـە تـیرەی قامیش، ساقەتەکەی دەتاشن بۆ قەڵەم ☰ نـوعی نی که از آن قلم نی سازند

**ژاعر / ja'ir/**: ☜ **ژار¹**

⊡ **ژاعریا ماری**: ☜ **زەهرەمار**

⊡ **ژاعر بیایش**: ١. تاڵ وەک ژەهر لـێ هـاتن ٢. گەنین؛ گنخان (خواردەمـەنی) ٣. /*کینایە*/ دژوار بوون ☰ ١. تلخ شدن ٢. فاسد شدن (مواد خوراکی) ٣. دشوار شدن

**ژاعر دایش**: دەرمانخوارد کردن ☰ مسموم کردن

**ژاعری / ja'(i)rî/**: ناو. ژەهراوی زاری جانـەوەر ☰ زهر دهان جانور

**ژاعرین / ja'(i)rîn/**: ناوەڵناو. ژاعـرێنی؛ تـاڵ وەک ژەهر ☰ تلخ چون زهر

**ژاعرێنی / ja'(i)rênî/**: ☜ **ژاعرین**

**ژاڤێن / javên/**: ناو. ڕەوتی ژیانـەوە؛ بووژانـەوە ☰ احیا

**ژاک / jak/**: ☜ **ژەک ـ١**

**ژاکـارد / jakard/**: نـاو. کەرسـتەیەک لـە سـەر ماشێنی جۆلایی بۆ نەخشدار کـردنی پارچـە ☰ ژاکارد

**ژاکـان / jakan/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //ژاکـای؛ دەژاکێـی؛ بژاکێ// ژاکیان؛ سیس بوون؛ چرچ بـوون ‹بـاخی ژینم بە خـەزان ژاکـاوە/ کـاتی مەرگـە و ئەجـەلیش ناکاوە «سوارە»› ☰ پژمُردن

■ ناوەڵـناوی بـەرکاری: ژاکـاو/ چـاوگی نـەرێنی: نەژاکان

**ژاکانـدن / jakandin/**: چـاوگ. تێـپەڕ. //ژاکانـدت؛ دەژاکێنی؛ بژاکێنـە// ژاکـانن؛ چرچانـدن؛ سـیس کردن ☰ پژمُردە کردن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەژاکاندن

**ژاکانن / jakanin/**: ☜ **ژاکاندن**

**ژاکـاو / jakaw/**: ناوەڵـناو. ژاکیـاگ؛ ژووڵـیاگ؛ چرچاو؛ سیس‌هەڵگەڕاو ☰ پژمُردە

**ژاکاوی / jakawî/**: ناو. چرچی؛ ژەڵـم؛ سیسـی ☰ پژمُردگی

**ژاکنـای / jaknay/**: چـاوگ. ژاکانـدن ☰ پژمُـردە

کردن

**ژاکیاگ** / jakyag/: ☜ ژاکاو

**ژاکیان** / jakyan/: ☜ ژاکان

**ژاکیای** / jakyay/: چاوگ. ژاکان ≡ پژمُردن

**ژاڵ**[1] / jał/: ☜ ژار[1]

• **ژاڵ**[2]: پاشگر. کون؛ کولانە؛ جێ ‹هەنگەژاڵ› ≡ جای؛ لانه

**ژاڵ**[3]: پێرۆ. ← ژنوژاڵ

**ژاڵک** / jałik/: ناو. ڕوول؛ قرژانک؛ ڕوولک ≡ خرزهره

**ژاڵەمۆ** / jałemo/: ☜ ژیلەمۆ

**ژاڵە** / jałe/: ناو. ١. لوورک؛ لوولک؛ لوێڕ؛ ڕوولک ٢. شەونم؛ خوناو؛ ئاونگ ‹مەدرەوشا ژاڵەی ئەبر بەهاری/ جە شاخەی گولان وێنەی مرواری «خانای قوبادی»› ≡ ١. خرزهره ٢. شبنم

**ژام** / jam/: ناو. ژان؛ چام؛ زەنگی کلیسا ≡ ناقوس کلیسا

**ژامبۆن** / jambon/: ناو. گۆشتی ڕان بەتایبەت گۆشتی ڕانی بەراز، گا یان مریشک کە لە کارخانەدا بەسەبەندی دەکرێ، وەک باسترمە دەپێچرێتەوە بۆ خواردن ≡ ژامبون

**ژامکوش** / jamkuş/: ناو. مجێوری زەنگی کلیسا ≡ ناقوس‌زن کلیسا

**ژان** / jan/: ناو. ١. ئێش؛ ئازار ٢. دەردی منداڵ بوون ٣. نەخۆشی؛ ناساغی ٤. چۆنیەتی ماست بوونە دۆ ٥. کاری مەشکە ژەندن ٦. ☜ ژام ≡ ١. درد ٢. درد زایمان ٣. بیماری ۴. فرایند دوغ شدن ماست ۵. عمل به هم زدن مشک ۶. ☜ ژام

◙ **ژان ژۆر**: ☜ ژان و ژۆر

**ژانا زراڤ**: ☜ ژانەزراڤ

**ژانی ناسۆر**: دەردی کاری؛ ژانی گران ‹ژانی ناسۆری جودایيم چێشتووە/ هەرچی خۆشم ویستووە جێم هێشتووە «هێمن»› ≡ درد جانکاه

◙ **ژان بردنە زگ/ دڵی کەسێکەوە**: ئێش و ئازار (زۆرتر ڕۆحی) گەیاندنە کەسێ ≡ داغ به دل کسی گذاشتن

**ژان سرەوتن**: ئێش لاچوون؛ ئارام بوونەوە ‹بمرێ ئەو کەسەی کە شەڕی ئەوێ/ ئازارێ بگرێ ژانی نەسرەوێ «قانع»› ≡ درد آرام گرفتن

**ژان ڤەتیش**: ☜ ژان کەردش

**ژان کردن**: ١. ئێشان (ئەندام) ٢. زگ ئێشان ‹مناڵەکەم ژانی کردووە› ٣. [کینایە] زۆر ماندوو بوون ‹هێندەم غار دا ژانم کرد› ≡ ١. درد گرفتن (اندام) ٢. درد کردن شکم ٣. بسیار خسته شدن

**ژان کەردش**: ژان ڤەتیش؛ تووشی نەخۆشی هاتن ≡ دچار بیماری شدن

**ژان گرتن**: دەست پێ‌کردنی ئێشی مناڵ بوون ≡ دچار درد زایمان شدن

**هاتنە ژان**: هاتنە ئێش ≡ به درد آمدن

**ژانازراڤکەتی** / janaz(i)ravketî/: ناو. وەرەمدا؛ وەرەمی؛ سیار؛ دیقاوی ≡ مسلول

**ژانباد** / janbad/: ناو. باداری؛ ژانژوو؛ ڕوماتیسم ≡ رُماتیسم

**ژاندار** / jandar/: ناوەلناو. ١. بە ئێش؛ ئێشدار ٢. نەخۆش؛ ناساغ ٣. چەکدار؛ بەچەک ≡ ١. دردآلود ٢. بیمار ٣. مُسلَّح

**ژاندارم** / jandarm/: ناو. ژاندارمە؛ جندرمە ≡ ژاندارم

**ژاندارمە** / jadarme/: ☜ ژاندارم

**ژاندن** / jandin/: چاوگ. ژەندن؛ ژای؛ هێنان و بردن بە پاڵ پێوەنان (مەشکە و ...) ≡ به هم زدن و تکان دادن (مَشک و ...)

**ژانر** / janr/: ناو. چەشن و چەمکێکی تایبەت لە کاری هونەری و ئەدەبیدا ≡ ژانر

**ژانژوو** / janjû/: ☜ ژانباد

**ژانڤیە** / janviye/: ناو. ژانویە؛ کانوونی دووهەم؛

مانگی هەوەڵی ساڵی زایینی کە ٣١ ڕۆژە و لە ١١ی بەفرانبارەوە دەس پێدەکات ☰ ژانویه

**ژانکردوو**[1] / jankirdû/: ناو. کەسێ کە ژانی تووش بووبێ ☰ کسی که دردش گرفته

**ژانکردوو**[2]: ئاوەڵناو. بزۆز؛ بێئارام؛ دانەسەکناو ☰ بی‌قرار

**ژان و با** / jan û ba/: ☜ **ژان و برک**

**ژان و برک** / jan û birk/: ناو. ژان و با؛ ژان لە خالیگە ☰ درد تهیگاه

**ژان و ژوور** / jan û jûr/: ناو. ژان ژوور؛ ژانی کەمێ بەر لە منداڵ بوون ☰ درد کمی قبل از زایمان

▣ **کەوتنە ژان و ژوور**: نزیک لە زایین بوونەوە ☰ نزدیک شدن به وضع حمل

**ژانویه** / janwiye/: ☜ **ژانڤیه**

**ژانۆ** / jano/: ناو. نەخۆش؛ لەش‌بەبار ☰ بیمار

**ژانەدرۆزنە** / janed(i)roz(i)ne/: ناو. ژان‌ژوو؛ بەرەژان؛ ژان لێ هاتنی زگ‌پڕ بەر لە وەختی ژانی زان ☰ درد کاذب پیش از زایمان

**ژانەزراڤ** / janez(i)rav/: ناو. ژانازراڤ؛ سیل؛ دیق؛ دەردەباریکە ☰ بیماری سل

**ژانەزک** / janezik/: ناو. سک‌ئێشەی ئەستەم ☰ شکم‌درد سخت

**ژانەسەر** / janeser/: ناو. سەرئێشەی ئەستەم ☰ سردرد سخت

**ژانەسی** / janesî/: ناو. دەردەسی؛ پزوو؛ فرک؛ نەکسۆ ☰ ذات‌الریه

**ژانەهوورک** / janehûrik/: ☜ **ژانەهوویرک**

**ژانەهوویرک** / janehûyrik/: ناو. ژانەهوورک؛ وردەژان؛ بەرەژان؛ ژانی پێش ژانی منداڵ بوون ☰ پیش‌دردهای قبل از درد زایمان

**ژانین** / janîn/: چاوگ. ١. ئێشان؛ ئازار پێ گەیشتن ٢. نەخۆش کەوتن ☰ ١. درد گرفتن ٢. بیمار شدن

**ژاو**[1] / jaw/: ناو. ١. ماستی بە دۆ کراو دە مەشکەدا ٢. ژا؛ کاوێژ ☰ ١. ماست دوغ شده در مَشک ٢. نشخوار

- **ژاو**[2]: پاشەوشە. جووراو؛ ژایسە؛ ژاییە؛ ژاویاو؛ جاویاگ ☰ جویده

**ژاوای** / jaway/: چاوگ. جاوین؛ جووین ☰ جویدن

**ژاوتەی** / jawtey/: چاوگ. ژاوای؛ جاوین ☰ جویدن

**ژاوە**[1] / jawe/: ناو. ١. ئاوی ڕوون ٢. جمە؛ شلۆقی ☰ ١. آب صاف ٢. ازدحام

▣ **ژاوە هاتن**: جمە هاتن؛ زۆر قەرەباڵغ بوون ‹شاری وێران وەک شاری تۆ و دێهاتی/ ژاوەی ئەهات لە نەخۆشی و لە قاتی «گۆران»› ☰ جای سوزن انداختن نبودن

**ژاوە**[2]: دەنگەناو. ١. دەنگی بەق؛ قڕەی بۆق ٢. ژاوەژاو؛ دەنگی غەڵبەغەڵب و چەقە و گوڕە ☰ ١. آواز قورباغه ٢. صدای شلوغی و هیاهو

**ژاوەرۆ** / jawero/: ناو. چۆمی هەمیشە ڕوون ☰ رود همیشه صاف و گوارا

**ژاوەژاو**[1] / jawejaw/: ناو. لاژەلاژ؛ مزەمز: ١. قسەی لەسەرخۆ و هێواش ٢. قسەی قۆڕ؛ چەلتە ٣. کاری چەندپاتە کردنەوەی قسەی بێتام ☰ ١. سخن کند و آرام ٢. ژاژ ٣. ژاژخایی

**ژاوەژاو**[2]: ئاوەڵکار. لاژەلاژ؛ بە هێواشی و لە سەر خۆ (قسە کردن) ‹ژاوەژاو چ دەڵەی؟› ☰ آهسته (سخن گفتن)

**ژاوەژاو**[3]: دەنگەناو. ١. دەنگی تێکەڵاوی بۆقان ‹ڕۆژ پڕە گوێمان لە بەر ئەنهار و جۆگە و هاژەهاژ/ شەو نییە خەومان لە بەر قرژاڵ و بۆق ژاوەژاو «نالی»› ٢. *[پلار]* جاوەجاو؛ زەنا ـ زەنا ‹یەک چرکە گوێی لێ بگرە! بەلام تەنها و دوور لە ژاوەژاو› ☰ ١. صدای درهم آمیختەی قورباغەها ٢. جنجال و همهمه

**ژاوەی** / jawey/: چاوگ. جاوین ☰ جویدن

**ژاویا / jawya/**: ئاوەڵناو. ژایسە؛ ژاییە؛ ژاویاو؛ جووراو؛ جاویاو؛ جاویاگ ⇐ جویده

**ژاویاو / jawyaw/**: ☜ ژاویا

**ژاویای / jawyay/**: چاوگ. جوان؛ جاویان ⇐ جویده شدن

**ژاوین / jawîn/**: چاوگ. ۱. جاوین؛ جووتن؛ جوون ۲. کاوێژ کردن ⇐ ۱. جویدن ۲. نشخوار کردن

**ژای[1] / jay/**: ☜ ژاندن

**ژای[2]**: ☜ ژا[2]

**ژایسه / jayse/**: ☜ ژاویا

**ژاییه / jayye/**: ☜ ژاویا

**ژبا / j(i)ba/**: ئامراز. لای؛ لە کن؛ لنک؛ لجەم ⇐ نزدِ؛ پیشِ

**ژبر / j(i)bir/**: ناو. کەف؛ تەخت؛ تەرک ⇐ کف

**ژبل / jibil/**: ئامراز. جگە لە ⇐ بجُز

**ژبن / jibin/**: ئاوەڵکار. بێشک؛ بێسۆ؛ بێئەولاولا ⇐ قطعاً؛ حتماً

**ژبنی / j(i)b(i)nî/**: ئاوەڵکار. هەرگیز؛ قەت ⇐ هرگز

**ژبۆ / jibo/**: ئامراز. بۆ خاتری؛ لە بەر ⇐ از برای؛ برای

**ژبۆنا / j(i)bona/**: ئامراز. لە سۆنگەی؛ بە هۆی ⇐ به اُمید

**ژبەر[1] / j(i)ber/**: ئاوەڵکار. لە بەر؛ لبەر ⇐ ازبر؛ حفظ

**ژبەر[2]**: ئامراز. ۱. لە بەر؛ بۆ خاتری؛ سەبارەت بە ۲. لە جێی ⇐ ۱. از برای؛ به خاطرِ ۲. به جای

**ژبەرچی / j(i)berçî/**: ئاوەڵکار. بۆچی؛ لە بەر چی ⇐ چرا؛ به چه دلیل

**ژبەرخۆ / j(i)berxo/**: ئاوەڵکار. هەر لە خۆوە؛ لە خۆیەوە ⇐ خود به خود

**ژبەرڤاژیڤە[1] / j(i)bervajîve/**: ئاوەڵناو. پێچەوانە ⇐ وارونه

**ژبەرڤاژیڤە[2]**: ئاوەڵکار. بە لای ئاوەژوودا ⇐ وارونه

**ژبەرهەڤ / j(i)berhev/**: ئاوەڵکار. ۱. بەرانبەر بە یەک ۲. لە بەرانبەردا ⇐ ۱. برابر هم ۲. در مقابل

**ژبەش / j(i)beş/**: ناو. ژەبەژ؛ ژەبەش؛ جەبەژ؛ جەبەش؛ شفتی؛ شووتی؛ هەنی؛ شامی ⇐ هندوانه

**ژبیرکری / j(i)bîrk(i)rî/**: ناو. فەرامۆشی؛ دۆخی شت لە بیر چوون ⇐ فراموشی

**ژبیرکەر / j(i)bîrker/**: ئاوەڵناو. فەرامۆشکار؛ تایبەتمەندی مرۆیێ کە زوو شتی لە بیر دەچێ ⇐ فراموشکار

**ژپێلڤە / j(i)pêlve/**: ئاوەڵکار. دەسبەجێ؛ بێ سێودوو ⇐ بی‌درنگ

**ژپێوە / j(i)pêwe/**: ئاوەڵکار. بە پاوە؛ نە بە دانیشتن یان ڕۆیشتن ⇐ ایستاده

**ژچ / jiç/**: ☜ ژچه

**ژچه / j(i)çe/**: ئاوەڵکار. ژچ؛ ژچی؛ بۆ؛ بۆچی ⇐ چرا

**ژچی / j(i)çî/**: ☜ ژچه

**ژخۆ[1] / j(i)xo/**: ناو. شخۆ؛ نەتشت؛ هیچ ⇐ هیچ

**ژخۆ[2]**: ئامراز. شخۆ؛ ئاها؛ کە وایە ⇐ که اینطور

**ژدل / j(i)dil/**: ئاوەڵکار. بە ڕاستی؛ لە دڵەوە ⇐ به راستی

**ژدێل / j(i)dêl/**: ناو. ۱. قەرەبوو؛ کاری بژاردنەوە ۲. گۆڕینەوە ⇐ ۱. جُبران ۲. مُعاوضه

**ژدێلا[1] / j(i)dêla/**: ناو. دووسبەی؛ دووسوو؛ دووسبحەی؛ دوو ڕۆژی تر ⇐ پس‌فردا

**ژدێلا[2]**: ئاوەڵکار. دووسبەی؛ دووسوو؛ لە دوو ڕۆژی تردا ⇐ پس‌فردا

**ژرەژ / j(i)rej/**: ☜ ژەرەژ

**ژریژ / j(i)rîj/**: ناو. ژریژ؛ ژێریژ؛ زریج؛ مز؛ قەلایی؛ قالایی؛ قەلای؛ قەلا؛ کەلناس؛ توخمی کیمیایی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ۵۰ و کێشی ئەتومی ۱۱۸،۶۹، سپی مەیلەو شین، بریقەدار، نەرم و

چەکوشخۆر، کە بۆ سپی کردنەوەی مس و چێ‌کردنی تەنەکە و ئالیاژی‌تر بە کار دێ ☰ ارزیز؛ قلع

**ژریژ** / j(i)rêj/: ☜ **زریژ**

**ژزوده** / jizûde/: ئامراز. هەر لە مێژەوە؛ لە زووڕا ☰ پیش از این‌ها

**ژزیلک** / jizîlik/: ☜ **چزڵیك**

**ژژو** / jijû/: ☜ **ژیشك**

**ژست** / jist/: ناو. ژیست؛ بیچم؛ بڕوبیچم؛ شیلەک؛ ملق: ۱. دۆخ و دیمانی ئەندامان، بەتایبەت دەس، بالاتەنە و سەروچاو بۆ دەربڕینی مەبەستێک یان پێداگری لە سەر شتێک ‹ژستێکی باشی هەبوو› ۲. [مەجاز] بزوان یان هەڵس‌وکەوتێک کە نیشاندەری واتا یان بڕوایەکە ‹ژستی رامیاری› ☰ ۱و۲. ژست

▣ **ژست گرتن:** قیافە گرتن؛ خۆ بە جۆرێکی تایبەت شاندان ☰ ژست گرفتن

**ژڤر** / jiv(i)r/: ناو. گەوەزن؛ گاکێوی ☰ گوزن

**ژڤژی** / jiv(i)jî/: ☜ **ژیشك**

**ژڤێڤه** / j(i)vêve/: ئامراز. ۱. لەوە بەو لاوە؛ دوای ئەوە ۲. لەوێنا؛ لەوێڕا ☰ ۱. بعد از آن ۲. از آنجا

**ژقلته** / jiqilte/: ☜ **زار**[1]

**ژقەلته** / j(i)qełte/: ☜ **زار**[1]

**ژقەنڤه** / jiqenve/: ئاوەڵکار. بە لانی کەم؛ هیچ نەبێ ☰ دست‌کم

**ژل** / jil/: ناو. ژیل؛ ژێل؛ هەر ماکێکی تێکەڵاوی کلۆئیدی گرساو (وەک: ژیلی دەرمان و قژ و...) ☰ ژل

**ژلاتین** / j(i)latîn/: ناو. ژیلاتین؛ تێکەڵاویک لە پرۆتۆئینگەل بە شێوەی گەرد یان پەڕەی بێ‌ڕەنگ، بێ‌بۆن و بێ‌تام کە بۆ بەرهەم هێنانی چەسپی کاغەز، فیلمی وێنەهەڵگری، بەستەنی و ژلە بە کار دەڕوا ☰ ژلاتین

**ژلۆق** / j(i)loq/: ☜ **ژلوق**

**ژلوق** / j(i)lûq/: ئاوەڵناو. ژلۆق؛ شلۆق: ۱. تێکەڵ‌ـپێکەڵ و بێ‌سەرەوبەرە ۲. جەنجاڵ؛ قەرەباڵغ؛ پڕحەشامەت ۳. هاروهاج؛ دەست‌بزێو ☰ ۱تا۳. شلوغ

**ژلوقان** / j(i)lûqan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //ژلووقای؛ دەژلووقێی؛ بژلووقێ// ژلووقیان؛ ژلۆق بوون؛ شپرز و بلاو بوون ☰ شلوغ شدن؛ آشفتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ژلووقاو/ چاوگی نەرێنی: نەژلووقان

**ژلوقاندن** / j(i)lûqandin/: چاوگ. تێپەڕ. //ژلووقاندت؛ دەژلووقێنی؛ بژلووقێنە// ژلووقانن؛ تێکەڵ و پێکەڵ کردن ☰ شلوغ و آشفته کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ــــ/ چاوگی نەرێنی: نەژلووقاندن

**ژلوقانن** / j(i)lûqanin/: ☜ **ژلوقاندن**

**ژلوقاو** / j(i)lûqaw/: ئاوەڵناو. ژلووقیاگ؛ بە سەر یەکا شێواو ☰ شلوغ و آشفته شده

**ژلوقیاگ** / j(i)lûqyag/: ☜ **ژلوقاو**

**ژلوقیان** / j(i)lûqyan/: ☜ **ژلوقان**

**ژله** / j(i)le/: ناو. ژیلە؛ جۆرێ خواردەمەنی کە بە ئاومیوە و گەردی ژلاتین و شەکر چێ دەکرێ ☰ ژله

**ژلیقان** / j(i)lîqan/: چاوگ. پلیخان؛ تلێقیان؛ تلێقیانەوە ☰ له شدن

**ژلیقانن** / j(i)lîqanin/: چاوگ. پلیخاندنەوە؛ تلێقاندنەوە ☰ له کردن

**ژڵ** / jił/: ناو. تاڵەمێو؛ لقی باریکی ڕەز ☰ شاخەی باریک تاک

**ژڵەژان** / j(i)łejan/: ☜ **شڵەژان**

**ژڵیوان** / j(i)łîwan/: چاوگ. ژڵیویان؛ شێوان؛ تێکەڵ‌ـپێکەڵ بوون ☰ آشفتن

**ژڵیوانن** / j(i)łîwanin/: ☜ **شڵەژاندن**

**ژلیوه** / j(i)łîwe/: ناو. ئاژاوه؛ پشێوی؛ تێکەڵ‌-پێکەڵی ≡ درهم‌برهمی

**ژلیویان** / j(i)łîwyan/: ☜ ژلیوان

**ژلێژنای** / j(i)łêjnay/: ☜ شڵەژاندن

**ژلێژیای** / j(i)łêjyay/: ☜ شڵەژان

**ژلێونای** / j(i)łêwnay/: چاوگ. تەکان دان؛ بزواندن ≡ تکان دادن

**ژلێویای** / j(i)łêwyay/: چاوگ. تەکان دران؛ بزوان ≡ تکان خوردن

**ژمار**[1] / j(i)mar/: ناو. هەژمار؛ هژمار؛ ئەژمار؛ شمار: ۱. حیساب؛ ئەناز ‹هاتنە ژمار› ۲. شۆ؛ ئەندازە؛ ڕادە؛ گۆرەبا ‹بێ حیساب و بێ ژمار› ۳. هەژمارە؛ ئەژمارە؛ ژمارە؛ شماره ‹ژماری دوژمن› ≡ ۱تا۳. شُمار

▣ **هاتنە ژمار**: هاتنە ئەژمار؛ هاتنە حیساب ‹ترسم هەیە بۆم بێتە ژمار ڕۆژی ژمار/ ئەو ژینە کە بێ یار و شەرابم ڕابرد «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ≡ به شُمار آمدن

**- ژمار**[2]: پاشەوشە. ـــ ژمێر؛ ـ شمێر ‹ڕۆژژمار› ≡ ـ شُمار

**ژمارای** / j(i)maray/: چاوگ. ژماردن ≡ شمُردن

**ژمارتن** / j(i)martin/: ☜ ژماردن

**ژمارتەی** / j(i)martey/: چاوگ. ژماردن ≡ شمُردن

**ژماردن** / j(i)mardin/: چاوگ. تێپەڕ. //ژماردت؛ دەژمێری؛ بژمێرە// ژمارتن؛ بژاردن؛ ئەژمارتن ≡ شمُردن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەژماردن

**ژمارده** / j(i)marde/: ناوەڵناو. ۱. بژێردراو؛ حەسێب‌کراو ۲. هەڵبژارده و هەرەچاک ≡ ۱. شمُرده ۲. برگُزیده

**ژماره** / j(i)mare/: ناو. ژمێره؛ شماره؛ ئەژمار؛ هەژمار؛ ئەژمارە؛ ئەژماهـ؛ بژار؛ بژاره: ۱. ڕەقەمێک کە نیشانەی ناسیاوی یان جێگەی کەسێ یان شتێک لە کۆمەڵێکدایە ‹ژمارەی سەندەڵی؛ ژمارەی پێناسە› ۲. پەڕە یان کاغەزێ کە تەرتیبێکی لە سەر دیاری کراوە ‹بۆ لای ئەم دوکتورە دەبێ پێشتر ژمارە بگرین› ۳. ئەندازە؛ ئەنازە؛ شۆ؛ گۆرەبا؛ ڕەقەمێک کە پیشاندەری قەبارەی شتێکە ‹ژمارەی پاتان چەندە؟› ≡ ۱تا۳. شُماره

▣ **ژماره داخستن**: ۱. پیشاندانی چەنیەتییەکی بگۆڕ بە شێوەیەکی خۆمەش ‹ئەگەر ئاو بڕوا، کونتور ژمارە دادەخا› ۲. نیشاندانی ژمارە تەلەفوون ≡ ۱و۲. شماره انداختن

**ژماره کردن**: ژمارە/ ڕەقەم دانان بە سەر شتێکدا ‹ماشینەکەم ژمارە کرد› ≡ شُماره کردن

**ژماره گرتن**: ژمارە وەرگرتن: ۱. ژمارە بە دەست هێنان ‹لە مونشی دوکتور ژمارەم گرت و دانیشتمە نۆرە› ۲. خولدان یان گوشار دانی ژمارەگەلی دیاریکراو لە سەر دەزگای تەلەفوون، بۆ پێوەندی گرتن ≡ ۱و۲. شُماره گرفتن

**ژماره لێدان**: نووسین یان لکاندنی ژمارە بە سەر شتێکەوە ‹وەرەقەکان ژمارە لێدە!› ≡ شُماره زدن

**ژماره هەڵگرتن**: ژمارە/ ڕەقەم نووسین؛ نووسینی ژمارەی شتێک ‹ڕانەندە پاش پێکدادانەکە دەرچوو بەلام شایەتەکان ژمارەی ماشینەکەیان هەڵگرت› ≡ شُماره برداشتن

**هەناسە کەوتنە ژماره**: ☜ هەناسە

**ژمارەکراو** / j(i)marek(i)raw/: ناوەڵناو. بژارتوو؛ ژمارده ≡ شمارش‌شده

**ژمارەکوت** / j(i)marekut/: ناو. شمارەکوت؛ دەزگایێ کە بە گوشاردانی لۆسەیەک، ژمارەی دڵخواز یان ژمارەی لە شوێن یەک بە سەر شتێکدا چاپ دەکا ≡ شُماره‌گیر

**ژمارەگر** / j(i)maregir/: ناو. ژمارەگیر؛ بەشێک لە دەزگای تەلەفوون و ... بە ژمارەگەلی ٠ تا ٩وە بۆ وەرگـرتنی ژمارەی ڕەچاوکراو و دامەزرانی پێوەندی ⚑ شُمارەگیر

**ژمارەگەر** / j(i)mareger/: ناو. ١. کەسێ کە شتێ دەژمێرێ و حیسابی دەکا ٢. کەسێ کە دەڕوانێتە ئەستێران و دەیانناسێتەوە ⚑ ١. مُحاسب ٢. ستارەشناس

**ژمارەگیر** / j(i)maregîr/: ☜ **ژمارەگر**

**- ژماری** / -j(i)marî/: ☜ **- ژمێری**

**ژماریار** / j(i)maryar/: ناو. ژمێریار؛ بژمێر؛ حیسابدار؛ حیسابگەر؛ دەخڵدار؛ خێڤزان؛ هساویەر؛ کەسێ کە کاری تۆمارکردن و پاراستنی حیسابی مەزرینگە یان بەشێکی دامودەزگایەکە ⚑ حسابدار

**ژمژیە** / jimj(i)ye/: ناو. جووڵە و بزاو ‹نازانێ/ چ نالە و چ ژان و ژمژیە و گرمەیەک/ وان لە ناو ئەو هەوری دەروونە قووڵەدا «شێرکۆ»› ⚑ جُنبش و تکان

**ژموور** / j(i)mûr/: ناو. جەموور؛ حیسابی ڕۆژ و مانگ لە هەورامانی کۆندا ⚑ نوعی تقویم در اورامان قدیم

**- ژمێر** / -j(i)mêr/: پاشەوشە. هەژمێر؛ - ژمار؛ ژمارەکەر ‹کاتژمێر؛ ساڵژمێر› ⚑ - شُمار

**ژمێراو** / j(i)mêraw/: ☜ **ژمێردراو**

**ژمێردران** / j(i)mêrd(i)ran/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //ژمێردرای؛ دەژمێردرێی؛ بژمێردرێ// هاتنە ژمارتن؛ ژمێران؛ حسێب کران ⚑ شُمُردە شدن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ژمێردراو/ چاوگی نەرێنی: نەژمێردران

**ژمێردراو** / j(i)mêrd(i)raw/: ناوەڵناو. ژمێراو؛ هەژمێراو ⚑ شُمردەشُدە

**ژمێران** / j(i)mêrran/: ☜ **ژمێردران**

**ژمێرە** / j(i)mêre/: ☜ **ژمارە**

**- ژمێری** / -j(i)mêrî/: پاشەوشە. بشمێری؛ - ژماری؛ - بژێری ⚑ - شُماری

**ژمێریار** / j(i)mêryar/: ☜ **ژماریار**

**ژمێریاری** / j(i)mêryarî/: ناو. سرژمێری ⚑ آمار

**ژمێژڤە** / j(i)mêjve/: ناوەڵکار. لەمێژەوە؛ لە زوووە ⚑ از قدیم

**ژن**[1] / jin/: ناو. زە؛ زینە؛ پیرەک؛ پنکۆ؛ پتۆ: ١. ئافرەت؛ عافرەت؛ مرۆی مێوینەی پێگەیشتوو ‹قەدیمییان وتوویانە ژن و ژیان› ٢. هاوسەری پیاو؛ ئاوجووت؛ هامجووت ‹ژنی دراوسێکەمان نەخۆشە› ٣. مرۆی مێوینە کە مێردی کردووە ‹دوو ژن و کچێک لێی کار دەکەن› ⚑ ١تا٣. زن

⊡ **ژنی بەمێرد**: ژنێ کە مێردی هەیە ‹ژنی بەمێرد، وەک باغی بەپەرژینە «مەسەل»› ⚑ زن متأهل؛ زن شوهردار

⊡ **ژن خواستن**: ☜ **ژن هێنان**

**ژن دان**: ژن پێ دان؛ ژنێ کردنە هاوسەری پیاوێک ‹ئەوان ژن نادەنە بێگانە› ⚑ زن دادن

**ژن هانین/ هاوردن**: ☜ **ژن هێنان**

**ژن هێنان**: ژنانین؛ ژن خواستن؛ ژن هانین/ هاوردن؛ ژەن ئاردەی؛ هاوسەر پەیدا کردنی پیاو ⚑ زن گرفتن

**- ژن**[2]: پاشەوشە. ١. - ژەن؛ داخەر؛ پێوەدەر ‹شەوەژن› ٢. هاوسەری مێوینە ‹براژن› ٣. ڕاتلەکێن؛ ژەنێ ٤. بیسەر ⚑ ١. - بست ٢. - زن ٣. بە هم زن ۴. - شنو

**ژناپ** / jin'ap/: ☜ **مامۆژن**

**ژناغە** / jin'ağe/: ☜ **ژناخە**

**ژناخە** / j(i)naxe/: ناوەڵناو. [پلار] ژنئاغە؛ ئاڵی؛ دەستگۆ؛ ژنوەزۆر؛ ژنوەزوور؛ شاکەڵ؛ شەکلە؛ چەکلێ؛ ژێردەست و گوێلەمستی ژن (هاوسەر) ‹دراوسێکەمان یەکجار ژناخەیە› ⚑ زنذلیل

**ژناسای / j(i)nasay/**: چاوگ. ناسین 🇮🇷 شناختن

**ژناسیای / j(i)nasyay/**: چاوگ. ناسران 🇮🇷 شناخته شدن

**ژنانـــەدوور / j(i)nanedûr/**: ئاوەڵنـــاو. دوورەوەی جل‌وبەرگ و پێڵاوی ژنانە 🇮🇷 زنانەدوز

**ژنانە / j(i)nane/**: ئاوەڵناو. سـەر بـە ژنـان یـان تایبەتی ژن ‹کراسی ژنانە› 🇮🇷 زنانە

**ژنانی / j(i)nanî/**: ☜ **ژنانیلە**

**ژنانیلە / j(i)nanîle/**: ئاوەڵناو. *[پلار]* ژنیلانە؛ ژنانی؛ ژن‌باو؛ ژن‌ڕەنگ؛ ژنەڕەنگ؛ ژنەڕەنگە؛ بلەکناچێ؛ قالەژنە؛ ئاریلە؛ لووسکەی ژن‌ئاسا 🇮🇷 زن‌نما

**ژنانین / j(i)nanîn/**: ☜ **ژن هێنان**

**ژناوژن / j(i)nawjin/**: ☜ **ژن‌بەژن**

**ژنایەتی / j(i)nayetî/**: ناو. ژنەتی: ١. کەیوانوویی؛ دۆخی دەس‌نەخشـین و لێهـاتوو بـوونی ژن ٢. دۆخ یان چۆنیـەتی هـەبوونی تایبەتمەندیگـەلی ژنانە 🇮🇷 ١. کدبانویی ٢. زنانگی

**ژن‌باب / jinbab/**: ناو. ژن‌باڤ؛ باوەژن 🇮🇷 نامادری

**ژنباز / jinbaz/**: ئاوەڵناو. *[شووورەیی]* تۆلاز؛ خانمباز؛ گـەڕا؛ ئـۆگری ئەویـنـداری و هاوئـامێزی‌کـردن لەگەڵ ژنان 🇮🇷 زنباز

**ژنبـازی / jinbazî/**: نـاو. *[شـوورەیی]* تـۆلازی؛ خانمبازی؛ کاری ئەوینداری کردن و هاوئـامێزی کردن لەگەڵ ژنان 🇮🇷 زنبازی

**ژن‌باڤ / jinbav/**: ☜ **ژن‌باب**

**ژن‌باو / jinbaw/**: ☜ **ژنانیلە**

**ژن‌بـرا / jinb(i)ra/**: نـاو. ژن‌ورا؛ ژن‌وراگ؛ بـرای هاوسەری پیاو 🇮🇷 برادرزن

**ژن‌بـەژن / jinbejin/**: نـاو. *[دابی کـۆن]* ژنـاوژن؛ ژن‌بەژنە؛ ژن‌واژن؛ کارەسـاتی پێـک‌گۆڕینـەوەی خوشک یـان کـچ، بـۆ هاوسـەری 🇮🇷 معاوضـەی محارم برای همسری

**ژن‌بەژنە / jinbej(i)ne/**: ☜ **ژن‌بەژن**

**ژن‌بەمز / jinbem(i)z/**: ناو. *[شوورەیی]* بێ‌نـامووس؛ دەویت 🇮🇷 قُرمساق

**ژن‌بی / jinbî/**: ناو. ژنەبی؛ بێوەژن؛ ژنی بێ‌شوو 🇮🇷 بیوەزن

**ژن‌تـی / jintî/**: نـاو. بـراژن؛ ژنی بـرا 🇮🇷 زن‌بـرادر؛ زن‌داداش

**ژن‌حیز / jinĥîz/**: ئاوەڵناو. *[شـوورەیی]* بـێ‌نـامووس؛ تایبەتمەندی کەسێ کـە ژنەکـەی حیـز بـێ 🇮🇷 بی‌ناموس

**ژن‌خاڵ / jinxal/**: ناو. خاڵۆژن؛ ژن لاڵۆ 🇮🇷 زن‌دایی

**ژن‌خـــواز / jinx(i)waz/**: ئاوەڵنـــاو. خوازیـــــاری هاوسەر(ژن)گیری ‹ئەرێ هۆ ڕاوکـەر! ڕاو هـا لـەم هەردە/ ئەگەر ژن‌خـوازی، دەسـت لـە مـاڵ بـەردە! «فولکلۆر»› 🇮🇷 زن‌خواه

**ژن‌خوشـک / jinxuşk/**: نـاو. ژەن‌وا؛ ژن‌خوویشـک؛ خوشکی هاوسەری پیاو 🇮🇷 خواهرزن

**ژن‌خوویشک / jinxûyş(i)k/**: ☜ **ژن‌خوشك**

**ژنـدار / jindar/**: ئاوەڵناو. هاوسـەردار (بـۆ پیـاو) 🇮🇷 مُتأهل (مرد)

**ژنڕاڵ / jinřał/**: ☜ **ژێنڕاڵ**

**ژن‌ڕەنگ / jinřeng/**: ☜ **ژنانیلە**

**ژن‌سالاری / jinsalarî/**: ☜ **ژنسەری**

**ژنسـەری / jinserî/**: نـاو. ژن‌سـالاری؛ نیزامێکـی کۆمەڵایـەتی کـە تێیـدا دەسـەڵات بـە دەسـت ژنانەوەیە 🇮🇷 زن‌سالاری

**ژن‌ڤیـان / jinv(i)yan/**: نـاو. خـوازبێن؛ داواکـار؛ خوازمەن 🇮🇷 خواستگار

**ژنک / j(i)nik/**: ناو. هاوسـەر؛ ژنی پیـاو 🇮🇷 همسرِ مرد

▣ **ژنکا پشت لە نەردێ**: *[کینایە]* ژنی مـارەکراو 🇮🇷 زن عقدکردە

**ژنکۆک / jinkok/**: ناو. ١. ژنی ناتەواو لە ئـاوەزا ٢. ژنی بێ ناو و نیشان 🇮🇷 ١. زن نـاقص عقـل ٢. زن

بی اصل و نسب

**ژنگار** / jingar/: ناو. جۆرێ هەنجیر ⇋ نوعی انجیر

**ژنمام** / jinmam/: ☜ مامۆژن

**ژنمـردگ** / jinmirdig/: ناوەڵناو. ژنمـردوو ⇋ زن‌مُرده

**ژنمردوو** / jinmirdû/: ☜ ژنمردگ

**ژنمێر** / jinmêr/: ناو. کەڵەژن؛ شێرەژن ⇋ شیرزن

**ژنواژن** / jinwajin/: ☜ ژن‌بەژن

**ژنورا** / jinw(i)ra/: ☜ ژن‌برا

**ژنوراگ** / jinw(i)rag/: ☜ ژن‌برا

**ژنوژاڵ** / jin û jał/: ناو. [پلار] دەستەی مێوینە، لە ژن و کچ ‹ئەو هەموو ژنوژاڵە لێرە چی ئەکەن؟› ⇋ جماعت اُناث

**ژن و ژنخـوازی** / jin û jinx(i)wazî/: نـاو. خزمایەتی نێوان دوو هۆز یان دوو بنەماڵە ⇋ قرابت سببی میان دو طایفه یا دو خانواده

**ژن و شوویی** / jin û şûyî/: ☜ ژن و مێردایەتی

**ژن و مناڵ** / jin û m(i)nał/: ☜ ژن و منداڵ

**ژن و منـداڵ** / jin û mindał/: نـاو. ژن و منـاڵ؛ خێزان ⇋ زن و بچه؛ خانواده

**ژن و مێردایـەتی** / jin û mêrdayetî/: نـاو. ژن و شـوویی؛ ژن و مێـردی؛ پەیوەنـدی نێـوان ژن و شوو ⇋ رابطه‌ی زناشویی

**ژن و مێردی** / jin û mêrdî/: ☜ ژن و مێردایەتی

**ژنوەزۆر** / jinwezor/: ☜ ژناخە

**ژنوەزوور** / jinwezûr/: ☜ ژناخە

**ژنۆ** / jino/: ☜ ئەژنۆ

**ژنۆکە** / j(i)noke/: ☜ جن

**ژنوو** / j(i)nû/: ناوەڵکار. دیسان؛ دیسانەکە ⇋ ازنو

**ژنەبی** / j(i)nebî/: ☜ ژن‌بی

**ژنەتی** / j(i)netî/: ☜ ژنایەتی

**ژنـەتیو** / j(i)netîw/: نـاو. [پـلار] کچـــەتیو؛ ژنی ئامازەپێ کراو ‹ژنەتیوە خەریک بوو منداڵەکەم لـێ بفڕێنێ› ⇋ زنیکه

**ژنەڕەنگ** / j(i)neřeng/: ☜ ژنانیلە

**ژنەڕەنگە** / j(i)neřenge/: ☜ ژنانیلە

**ژنەفتن** / j(i)neftin/: ☜ ژنەوتن

**ژنەوا** / j(i)newa/: ناوەڵناو. شنەوا؛ خاوەن توانـایی بیستن ⇋ شنوا

**ژنـەوایی** / j(i)newayî/: نـاو. هەسـتی وەرگـرتنی دەنگ و لێ تێگەیشتن ⇋ شنوایی

**ژنـەوتن** / j(i)newtin/: چاوگ. ژنـەفتن؛ ژنـەوین؛ شنەفتن؛ شنەوتن؛ ئەژنەوتن؛ بیسن؛ بیسـتن ⇋ شنیدن

**ژنەوتـوو** / j(i)newtû/: ناوەڵناو. بیسـتراو ⇋ شـنیده شده

**ژنەوتەی** / j(i)newtey/: چاوگ. ژنەوتن ⇋ شنیدن

**ژنـەویای** / j(i)newyay/: چـاوگ. بیسـتران ⇋ شنیده شدن

**ژنەوین** / j(i)newîn/: ☜ ژنەوتن

**ژنیاگ** / jinyag/: ناوەڵناو. ۱. لێکـدراو؛ شڵـەقیاگ ‹مەشکەی ژنیـاگ› ۲. داخراو؛ بەسـراو؛ بەسـیاگ ‹دەریای ژنیاگ› ⇋ ۱. به هم زده ۲. بسته شده

**ژنیـان** / jinyan/: چـاوگ. ۱. ☜ ژەنـران ۲. پێوەدرانی دەرگا و پەنجەرە ⇋ ۱. ☜ ژەنران ۲. بسته شدن در و پنجره

**ژنیای**[1] / jinyay/: ☜ ژەنران

**ژنیـای**[2]: ناوەڵناو. ۱. ژندار؛ خاوەن ژن ۲. داخراو ⇋ ۱. مُتأهل (مرد) ۲. بسته‌شده

**ژنیلانە** / j(i)nîlane/: ☜ ژنانیلە

**ژنـین** / j(i)nîn/: چـاوگ. پەسـتاوتن؛ ئـاخنین ⇋ آکندن

**ژنیەی** / jinyey/: چاوگ. ۱. بیستن ۲. بەسـتران ۳. ژەنران؛ لـێدران ٤. ژانـدران ⇋ ۱. شـنیدن ۲. بسته شدن ۳. نواخته شدن ۴. به هم زده شدن

**ژنێو** / j(i)nêw/: ☜ جنێو

**ژوار** / j(i)war/: ناو. ئازاری زۆر؛ ژانی سەخت ⇆ درد زیاد

**ژوان** / j(i)wan/: ناو. ١. وادە؛ بڕیار لە سەر یەکتر دیتن لە جێگەیەکی دیاریکراو ‹وەکوو نەرمەهەنگاوی لاوی بەرەو ژوان «سوارە»› ٢. ونەوز؛ چۆنیەتی چاو بە حاستەم چوونە خەو ⇆ ١. قرار؛ میعاد ٢. چُرت

**ژوانا** / j(i)wana/: ناوەڵناو. زەریف؛ خوشیک؛ سپەهی ⇆ زیباروی

**ژوانگە** / j(i)wange/: ناو. جێگەی بە یەکتر گەیشتن ‹خۆزگە پیری کەلەلای نەدەکردم/ خۆزگە لە یەکەم ژوانگەدا دەمردم «هێمن»› ⇆ میعادگاه

**ژورژێت** / jurjêt/: ناو. جۆرێک پارچەی ناسکی وردچن، کە ڕووەکەی نەختێ زروە ⇆ ژُرژت

**ژوژالک** / jujalik/: ☜ **ژوژالك**

**ژوژو** / jujû/: ☜ **ژیشك**

**ژوژی** / jujî/: ☜ **ژیشك**

**ژوڤان** / juvan/: ☜ **پەژیوان**

**ژوقم** / juq(i)m/: ناوەڵناو. تاڵ؛ تەحل ⇆ تلخ

**ژولسە** / julse/: ناوەڵناو. ١. ژاکاو؛ سیس‌هەڵگەڕاو ٢. پەشێو؛ پەرێشان ⇆ ١. پژمُردە ٢. آشفتەحال

**ژوڵیان** / jułyan/: چاوگ. سیس هەڵگەڕان؛ سیس هەلاتن؛ هەڵچرچان ⇆ پژمُردە شدن

**ژوم** / jum/: ☜ **ژەم**

**ژونرو** / junro/: ناو. ڕۆماتیسم؛ نەخۆشی ژانی ئێسک و جومگەی لەش ⇆ روماتیسم

**ژوی** / j(i)wî/: ناو. جەوی؛ جیوەی دار و گیا ⇆ انگُم

**ژۆ** / jo/: ئامراز. بۆیە؛ بەو بۆنەوە؛ لە بەر ئەوە ⇆ زیرا

**ژۆر** / jor/: ناو. لای سەروو؛ بەرەژوور ⇆ طرف بالا

**ژۆرین** / jorîn/: ناو. ١. لای سەرووی مەجلیس ٢. ناو ئۆدە ⇆ ١. صدر مجلس ٢. داخل اُتاق

**ژوڤار** / jovar/: ناو. شۆفار؛ قسەبەر ⇆ سخن‌چین

**ژوو** / jû/: ناو. ژانی منداڵ بوون ⇆ درد زایمان

**ژوور**[1] / jûr/: ناو. ١. لای سەروو ‹ئەو جار هەستەوە بڕۆ بەرەو ژوور/ مەوێستە هەتا تەشکی ئاسمان «هێمن»› ٢. ئۆدە؛ چاوەخانوو ‹ژوورێکم لە ماڵێکی نیزیک دوکان، لە ژنێکی کۆنەئەرمەنی تازەموسڵمان بە کرێ گرت «هەژار، چێشتی مجێور»› ٣. ناوەوە؛ ناوماڵ ٤. بەرسیلە؛ قۆرە ⇆ ١. بالا ٢. اُتاق ٣. تو؛ داخل ۴. غورە

⊡ **وە ژوور کەوتن:** چوونە ناوەوە ‹هەتا لێیان وە ژوور کەوتن یەساوڵ/ لە خەودا سواری سینگیان بوون نە خافڵ «هێمن»› ⇆ وارد محیط سربستە شدن

**ژوور**[2]: ☜ **ژووری**

**ژوور-**[3]: پێشوشە. سەر ‹ژوورسەر› ⇆ زِبَر

**ژوور**[4]: پێرۆ. ← **ژان‌وژوور**

**ژووراسیک** / jûrasîk/: ناو. دووهەمین دەورە لە دەورانی دووهەمی زەوینناسی کە بە سەرهەڵدانی دایناسۆران و گوهانداران و پەلەوەرانی سەرەتایی دەناسرێتەوە ⇆ ژوراسیک

**ژووران** / jûran/: ناو. [کینایە] کاتی سەرما هاتن و ژووری ماڵ گرتن ⇆ موسم سرما

**ژوورگ**[1] / jûrig/: ناوەڵناو. ژوورگین؛ بانگین؛ ژوورنگ؛ سەروو؛ ئەڤراز؛ لە لای ژووروو ‹گەڕەکی ژوورگ› ⇆ بالایی

**ژوورگ**[2]: جێناو. ژوورگین؛ ژوورنگ؛ سەروو؛ ئەڤراز؛ ئەوی لە ژووری ئەوانی ترە ‹گەڕەکی ژوورگ› ‹ژوورگ باشترە› ⇆ بالایی

**ژوورگین** / jûrgîn/: ☜ **ژوورگ**

**ژوورناڵ** / jûrnał/: ناو. گۆڤاری تایبەتی و زانستی کە لە هەر لقێکی زانستدا دەردەکرێ ⇆ ژورنال

**ژوورناڵیست** / jûrnałîst/: ناو. ڕۆژنامەنووس؛ ڕۆژنامەوان؛ کەسێ کە بۆ ڕۆژنامە هەواڵ دەنێرێ

🇮🇷 ژورنالیست

**ژورنالیستی** / jûrnałîstî/: ئاوەڵناو. ڕۆژنامەوانی؛ ڕۆژنامەیی ‹چالاکیی ژوورنالیستی› 🇮🇷 ژورنالیستی

**ژورنگ** / jûring/: ☜ **ژورگ**

**ژوورو** / jûrû/: ئاوەڵناو. سەروو؛ ژوورین ‹ماڵی ژوورو› 🇮🇷 بالا

**ژوورەوەی** / jûrewey/: ئامراز. ناوی؛ لە ناو 🇮🇷 درون

**ژووری** / jûrî/: ئامراز. ژوور؛ لای سەرووی؛ بان سەر؛ لە سەرووی ‹دووکەڵ، ژووری ئاگر ئەکەوێ «مەسەل»› 🇮🇷 بالای

**ژوورین** / jûrîn/: ئاوەڵناو. ژووروو؛ سەروو 🇮🇷 بالایی

**ژووژ** / jûj/: ئاوەڵناو. بەگوڕ؛ گەش؛ بەنەشەوگەشە 🇮🇷 سرحال؛ سرزنده

**ژوژاڵک** / jûjalik/: ناو. ژوژاڵک؛ کاڵەکەمارانە؛ گوژالک 🇮🇷 هندوانەی ابوجهل

**ژووژان** / jûjan/: ☜ **ژووژیانەوە**

**ژووژاندن** / jûjandin/: ☜ **ژووژاندنەوە**

**ژووژاندنەوە** / jûjand(i)newe/: چاوگ. تێپەڕ. //ژووژاندتەوە؛ دەژووژێنیەوە؛ بژووژێنەوە// ژووژانن؛ ژووژاندن؛ هێنانەوە گوڕ 🇮🇷 سرحال آوردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: —/ چاوگی نەرێنی: نەژووژاندنەوە

**ژووژانن** / jûjanin/: ☜ **ژووژاندنەوە**

**ژووژانەوە** / jûjanewe/: ☜ **ژووژیانەوە**

**ژووژک** / jûjik/: ☜ **ژیشك**

**ژووژنایەوە** / jûjnayewe/: چاوگ. ژووژاندنەوە 🇮🇷 سرحال آوردن

**ژووژوو** / jûjû/: ☜ **ژیشك**

**ژووژی** / jûjî/: ☜ **ژیشك**

**ژووژیاگ** / jûjyag/: ئاوەڵناو. بووژاوە؛ وەگوڕهاتوو 🇮🇷 سرحال آمده

**ژووژیان** / jûjyan/: ☜ **ژووژیانەوە**

**ژووژیانەوە** / jûjyanewe/: چاوگ. ژووژانەوە؛ ژووژیان؛ بووژان؛ بووژانەوە؛ ژووژان: ١. وەگوڕ کەتنەوە؛ هێز تێ کەوتنەوە ٢. گەشە کردن؛ گەورە بوون 🇮🇷 ١. سرِ حال آمدن ٢. رشد کردن

**ژووژیایەوە** / jûjyayewe/: چاوگ. ژووژیانەوە 🇮🇷 سر حال آمدن

**ژووشک** / jûşik/: ☜ **ژیشك**

**ژووڤە** / jûve/: ناو. جیوە 🇮🇷 جیوه

**ژوول** / jûl/: ناو. پێوانەی کار و هێز لە کۆئەندامی میتردا 🇮🇷 ژول

**ژووڵژاڵ** / jûljal/: ناو. بزاڤ؛ بزاو 🇮🇷 تکان

**ژووڵ** / jûł/: ناو. جووڵە؛ بزاو 🇮🇷 حرکت

**ژووڵان** / jûłan/: چاوگ. ژووڵین؛ جووڵان 🇮🇷 جنبیدن

**ژووڵنای** / jûłnay/: ☜ **جوولاندن**

**ژووڵە** / jûłe/: ☜ **جووڵە**

**ژووڵیاگ** / jûłyag/: ☜ **ژاکاو**

**ژووڵیان** / jûłyan/: چاوگ. ژاکان؛ پەژمران 🇮🇷 پژمُردن

**ژووڵیای** / jûłyay/: ☜ **جووڵان**

**ژووڵین** / jûłîn/: ☜ **ژووڵان**

**ژوون** / jûn/: ☜ **جنێو**

**ژوونی** / jûnî/: ☜ **زرانی**

**ژوویە** / jûyye/: ناو. جووولای؛ تەمووز؛ مانگی حەوتەمی ساڵی زایینی، ٣١ ڕۆژە و لە ١٠ی پووشپەڕەوە دەسپێدەکات و لە ٩ی گەلاوێژدا تەواو دەبێ 🇮🇷 جولای؛ ژوئیه

**ژە** / je/: ناو. ١. جە؛ جێگە؛ شوێن ٢. ڕۆخلەی بادراو بۆ کەوان 🇮🇷 ١. جا ٢. زهِ کمان

**ژەبەژ** / jebej/: ☜ **ژبەش**

**ژەبەش** / jebeş/: ☜ **ژبەش**

**ژەحر** / jeĥr/: ☜ **ژار**[١]

**ژەحرین** / jeĥrîn/: ئاوەڵناو. ژاحرین؛ تاڵ؛ تەحل 🇮🇷 تلخ

**ژەر / jer/**: ☜ **زار**[1]

**ژەرژی / jerjî/**: ☜ **ژەرەژ**

**ژەرەژ / jerej/**: ناو. ژەرەژی؛ ژرەژ؛ ژەرژی؛ کەو؛ مەلێکی دندووک سوور و ڕەنگینە لە کۆتر زلتر، بۆ گۆشتی و ڕاگرتن، ڕاوی دەکەن ‹ژەرەژ نەوانۆ جە سەر نساران/ شەماڵ نەشانۆ شەونم وە داران «بێسارانی»› ☰ کبک

**ژەرەژی / jerejî/**: ناو. ١. ☜ **ژەرەژ** ٢. جووچک ☰ ١. ☜ **ژەرەژ** ٢. جوجه

**ژەرەک / jerek/**: ناو. زیپکە؛ زیرکە ☰ جوش پوستی

**ژەژ / jej/**: ناوەڵناو. پیس؛ گلاو؛ چەپەڵ ☰ چرکین

**ژەڤ / jev/**: ئامراز. ژهەڤ؛ لێک؛ لە یەکتر ☰ از یکدیگر؛ از هم

⊡ **ژەڤ قەتیان**: لێک بڕان ‹ئەڤ دوو پەڤ دچوون، ژەڤ قەتیان› ☰ از هم جدا شدن

**ژەڤ کەتن**: تەواو کۆن بوون و ڕزان ☰ کُهنه شدن و فرسودن

**ژەڤەک / jevek/**: ناو. نێوان؛ مابەین ☰ بین

**ژەقنە / jeqne/**: ☜ **ژەقنەموت**

**ژەقنەبوت / jeqnebût/**: ☜ **ژەقنەموت**

**ژەقنەپوت / jeqnepût/**: ☜ **ژەقنەموت**

**ژەقنەموت / jeqnemût/**: سارسە. ژەقنە؛ ژەقنەبووت؛ ژەقنەپووت؛ زەقنەبووت؛ زەقنەبیت؛ زەقنەپووت؛ زەقنەمووت؛ ژقلتە؛ تووکێک وەک زەهری مار ☰ کوفت؛ زغنبود

⊡ **ژەقنەموت کردن**: *[پلار]* خواردن؛ کردنە زەهرەمار ☰ کوفت کردن

**ژەک / jek/**: ناو. ١. ژاک؛ فرچک؛ فرێشک؛ هەوەڵ شیر ٢. ڕیپۆقی چاو ٣. نیوەگەیشتوو؛ فەریکی گەنمەشامی ☰ ١. آغوز ٢. ژفک؛ قی چشم ٣. بلال کال

**ژەکلێرە / jeklêre/**: ناو. چلووورە؛ زەمبلە؛ زەمبەلیلک؛ قەندیل ☰ دنگاله

**ژەلمسە / jelm(i)se/**: ناوەڵناو. ١. ژولسە؛ ژاکاو ٢. شپرز؛ شێواو ☰ ١. پژمُرده ٢. آشفته

**ژەلە / jele/**: ناو. ژەڵە؛ ڕوول؛ قرژانک؛ قەرجلگ؛ کەرکوژە؛ ژاڵە ☰ خرزهره

**ژەڵم / jełm/**: ناو. ١. سیسی؛ ژاکاوی ٢. ئاوی بە توێژ و لێل ☰ ١. پژمُردگی ٢. آب کدر

**ژەڵمژا / jełmja/**: ناوەڵناو. باش نەجاوراو ☰ نیم‌جویده

**ژەڵمو / jełmû/**: ناوەڵناو. تەمەڵ؛ تەوەزەل؛ سست ☰ تنبل؛ لش

**ژەڵە / jełe/**: ☜ **ژەلە**

**ژەم / jem/**: ناو. ژوم؛ ژەمەن؛ جەم؛ وادەی خواردنی چێشت ‹تۆ لەبەر خاتر ژەمێکی خواردن/ گیانداریٚ وەک خۆت ئەخەیتە مردن؟! «قانع»› ☰ وعده‌ی خوراک

**ژەمبوردو / jemburdû/**: ناوەڵناو. ژەمبووردە؛ ژەمەن‌بردە؛ ژەمەن‌بگردگ؛ ژەمی خواردن لە دەست چوو ☰ در وعده‌ی خود (غذا و...) نخورده

**ژەمبوردە / jemburde/**: ☜ **ژەمبوردو**

**ژەم ـ ژەم / jem jem/**: ناوەڵکار. هەمیشەی نا بەڵکوو هات و نەهات ☰ گاهگاهی

**ژەمک / jem(i)k/**: ☜ **جەمك**

**ژەممردو / jemmirdû/**: ☜ **جەم‌مردو**

**ژەمەخوێری / jemex(i)wêřî/**: ناو. جەمەخوێریلە؛ ژەمی نێوان سێ ژەمی سەرەکی ☰ میان وعده

**ژەمەن / jemen/**: ناو. ١. ☜ **ژەم** ٢. بژیو؛ مایەی ژیان ٣. بەرەمەشکە؛ کەرەی بەرهەمی مەشکەیەک ☰ ١. ☜ **ژەم** ٢. قوت؛ مایەی زندگی ٣. کرەی حاصل از یک بار مشک زدن

**ژەمەناهەقە / jemenaheqe/**: ناو. عەسرۆژە؛ ژەمی نێوان فراوین و شێو ☰ عصرانه

**ژەمەن‌بردە / jemenbirde/**: ☜ **ژەمبوردو**

**ژەمەن‌بگردگ / jemenb(i)girdig/**: ☜ **ژەمبوردو**

⊡ **ساز لێدان:** ژەندنی ئامێری مۆسیقا ☰ ساز زدن

**ساز۲:** ئاوەڵناو. ١. شاد؛ دڵخۆش ‹پێکەوە سازین› ٢. دەوڵەمەند؛ دارا ‹لە هەژاری کەوتن و ئێستا شوکور سازن› ٣. ئامادە؛ تەیار ‹شێخێ بە ژنێ خراپی گوت: بێشەرمی/ بۆ هەرچی دەست بۆ بەرێ ساز و نەرمی «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ☰ ١. شاد ٢. ثروتمند ٣. آماده

⊡ **ساز بوون:** ١. ئامادە بوون ٢. دەوڵەمەند بوون ٣. ڕازی بوونی کچ بۆ شوو کردن ‹چەند خۆشە وەلام بگاتە دلدار/ مزگێنی بداتێ ساز بووە یار «هەژار، *مەم‌وزین*»› ☰ ١. آماده شدن ٢. ثروتمند شدن ٣. رضایت دادن دختر به ازدواج

**ساز دان:** ئامادە کردن ‹مەیخۆرەکان! دە وەرن و ساز دەین کۆڕێ/ مەیگێڕ وەرە! با دەفری شەراب هەڵچۆڕێ «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ☰ مُهیا نمودن

**ساز کردن:** ١. ئامادە کردن ٢. ڕاست کردن؛ تاو کردنی کچ بۆ شوو کردن. هەروەها: **ساز کران** ☰ ١. مهیا نمودن ٢. راضی کردن دختر برای ازدواج

**ساز هاتن:** دروست بوون؛ ڕێک هاتن ☰ جور شدن

**- ساز۳:** پاشوشە. ١. چێکەر؛ دروستکەر ‹ساعەتساز› ٢. چاککەرەوە ‹ڕادیۆساز› ٣. دابینکەر ‹کارساز› ☰ ١تا٣. ـ ساز

**سازاخ / sazax/:** ناو. تۆفی سەرما ☰ اوج سرما

**سازان / sazan/:** چاوگ. تێنەپەڕ. //سازای؛ دەسازێی؛ بسازێ// ساچان؛ سازای؛ سازیای: ١. بردنە سەر؛ لەگەڵ کەس یان شتێکدا هەڵکردن و نەرم و نیانی نیشان دان ‹لەگەڵ هەموو کەسێکدا ئەسازێ› ٢. پێ‌کەوتن؛ سازگار بوون ‹هەموو خۆراکێکی پێ ناسازێ› ٣. هاودەستی کردن؛ دەست کردنە یەک ‹لەگەڵ قازیدا سازابوون› ☰ ١تا٣. ساختن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: سازاو/ چاوگی نەرێنی: نەسازان

**سازاندن / sazandin/:** چاوگ. تێپەڕ. //سازاندت؛ دەسازێنی؛ بسازێنە// ١. پێک‌هێنانەوەی دوو دژ ٢. ئەنجام‌دانی کار ☰ ١. آشتی دادن مخالفین ٢. انجام دادن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەسازاندن

**سازای / sazay/:** ☜ **سازان**

**سازبەند / sazbend/:** ناو. ١. سازلێدەر؛ سازژەن ٢. دەستەی مۆسیقاژەنان ☰ ١. نوازندەی ساز ٢. گروه اُرکستر

**سازدراو / sazd(i)raw/:** ناو. درووسکراو؛ دروستکراو ☰ ساخته

**سازران / sazran/:** چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //سازرای؛ دەسازرێی؛ بسازرێ// ١. ئامادە کران ٢. جۆر کران ☰ ١. مهیا شدن ٢. درست شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: سازراو/ چاوگی نەرێنی: نەسازران

**سازژەن / sazjen/:** ناو. ژەنیار؛ سازبەند؛ سازلێدەر ☰ نوازنده

**سازشت / sazit/:** ناو. ١. ڕەوتی سازان ٢. ئاشتی ☰ ١. سازش ٢. آشتی

**سازڤان / sazvan/:** ناو. ١. ژەنیار؛ سازبەند ٢. مووسیقار ☰ ١. نوازنده ٢. موزیسین

**سازکری / sazk(i)rî/:** ئاوەڵناو. ئامادەکراو ☰ مُهیّا

**سازگ / sazig/:** ناو. تەڕەساز؛ ترشیاتێک کە شەلەمیشی تێدا بێت ☰ ترشی با شلغم

**سازگار / sazgar/:** ئاوەڵناو. جۆر: ١. بە تایبەتمەندی لێک‌هاتن و لەبار بوون ‹ئەو ڕەنگانە پێکەوە سازگار نین› ٢. ساز؛ کۆک ‹منداڵەکان پێکەوە سازگارن› ☰ ١و٢. سازگار

**سازگاری / saz(i)garî/:** ناو. تەبایی؛ جۆری؛ کۆکی ☰ سازگاری

**سازلێدەر / sazlêder/**: ناو. سازبەند؛ سازندە ☰ نوازندە

**سازنای / saznay/**: ناو. ١. پێکهێنان ‹مادەر ئەساسەی سەفەر سازنا/ بەو تەورە لەیلی عەرووس ڕازنا «خانای قوبادی»› ٢. دروست کردن ☰ ١. فراهم آوردن ٢. ساختن

**سازندە**[1] **/ sazinde/**: ناو. سازنە: ١. زوڕناژەن ٢. سازلێدەر ☰ ١. سُرنانواز ٢. نوازندە

**سازندە**[2]: ئاوەڵناو. [کینایە، پلار] سازنە؛ بێشەرم و زماندرێژ ☰ بی‌شرم و زبان‌دراز

**سازنە / saz(i)ne/**: ☜ سازندە

**سازنەچی / saz(i)neçî/**: ئاوەڵناو. لۆتی؛ بەزمگێڕ؛ ‹سازنەچییە و سوور کوڕ خوەی «مەسەل»› ☰ مُطرب

**ساز و ئاواز / saz û awaz/**: ناو. مووسیقا و گۆرانی ☰ ساز و آواز

**سازوباز / saz û baz/**: ناو. ساخت‌وپاخت ☰ تبانی

**سازوتەیار / saz û teyar/**: ئاوەڵناو. ١. ونار بەرهەف؛ ئامادە بۆ کارێ ٢. ئامادە و پرچەک (لەشکر) ☰ ١. آمادە ٢. با سازوبرگ (لشکر)

**سازودەوڵ / saz û dewł/**: ☜ سازودەهۆڵ

**سازودەهۆڵ / saz û dehoł/**: ناو. سازودەوڵ؛ سرنا و دەهۆڵ؛ ئەو سازە خۆماڵییانە کە لە جێژن و شاییدا باون ‹بە ساز و دەهۆڵەوە چوون بەرەو پیری بووک› ☰ ساز و دُهُل

**سازوسەودا / saz û sewda/**: ناو. خەیالاتی پڕ و پووچ ☰ خیال خام

**ـ سازی / -sazî/**: پاشوشە. ١. سازکردن ‹ڕادیۆسازی› ٢. کارگەی بەرهەمهێن ‹جانتاسازی› ☰ ١و٢. ـ سازی

**سازیار / sazyar/**: ئاوەڵناو. ١. چێکەر؛ دروستکەر ٢. ساچێن؛ سازیار ☰ ١. سازندە ٢. سازگار

**سازیان / sazyan/**: ☜ سازین ـ١

**سازیای / sazyay/**: ☜ سازان

**سازین / sazîn/**: چاوگ. تێنەپەڕ. تێپەڕ. //سازیت؛ دەسازی؛ بسازە// ◻ تێنەپەڕ. ١. ساچاندن؛ سازیان؛ پێکهێنان؛ هەڵکردن؛ نەرم و نیانی کردن دەگەڵ کەسێ، شتێ یان ڕووداوێ ‹لەگەڵ خەڵکدا سازین› ◻ تێپەڕ. ٢. کردنەوە؛ دروست کردنی بینا و خانوو ☰ ١. سَرکردن ٢. بنا کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەسازین

**سازێنەر / sazêner/**: ئاوەڵناو. ڕێکخەر؛ وەڕێخەر؛ کارامە و بە سوود بۆ چاک کردن و وێکخستن ☰ سازندە

**ساژور / sajur/**: ☜ ساجوڕ

**ساژوور / sajûr/**: ☜ ساجور

**ساسات / sasat/**: ناو. سووپاپێک لە زارکی کاربراتۆر بۆ کەم کردنەوەی هەوا، کاتی هەڵکردنی ماشێن ☰ ساسات

**ساسۆن / sason/**: ناو. کەلبەتان؛ درزێکی سێ گۆشە بۆ کەم کردنەوەی فش و فۆڵی جلک ☰ ساسون

**ساسی / sasî/**: ناو. ١. سۆنی؛ پند؛ جووجوو؛ قرنۆ ٢. گەدایی؛ سوالکەری؛ خوازەلۆکی ☰ ١. ساس ٢. گدایی

**ساغ / sağ/**: ☜ ساخ

◙ **ساغ بونەوە**: ☜ **ساخ بونەوە**

**ساغلەم / sağłem/**: ☜ ساخ

**ساغورەک / sağûrek/**: ناو. گاشەبەرد ☰ تختەسنگ

**ساغی / sağî/**: ☜ ساخی

**ساف**[1] **/ saf/**: ناو. ١. دەزووی لێفە دروون ٢. ☜ ساپ ـ٢ ☰ ١. نخ لحافدوزی ٢. ☜ ساپ ـ٢

**ساف**[2]: ئاوەڵناو. ١. بێ‌گنج؛ لووس؛ حولی ‹بەردی ساف› ٢. تەخت؛ ڕاست ‹زەوینی ساف› ٣. [مەجاز] دڵپاک و بێ‌فێل ‹پیاوی ساف› ☰ ١. صاف ٢.

هموار ۳. پاکدل

**ساف**[۲]: ئاوەڵکار. ۱. گش؛ هەموو؛ سەرلەبەر ‹ساف هەڵاتن› ۲. یەکڕاست ‹وتی سلام و ساف چووە سەر سفرە!› ☚ ۱. همگی ۲. راست

**سافان / safan**/: چاوگ. دلۆپە کردن؛ چکە کردن؛ تکە کردن ☚ چکە کردن

**سافاندن / safandin**/: چاوگ. تکاندن؛ دلۆپاندن؛ دلۆپە پێکردن ☚ چکانیدن

**سافکەر / safker**/: ناو. تووز؛ دەقاق؛ ئوتوو ☚ اتو

**سافلەساف / saf le saf**/: ئاوەڵکار. گش لەگشت؛ بەتەواوی ‹لەشکری شکاک ئیمەشی وەک هەموو خەڵکی سابلاخ، سافلەساف تالان کردن! «هێمن»› ☚ تمام و کمال

**سافۆ / safo**/: ناو. ۱. پارزن؛ پاڵوێنە؛ ڕاوەک ۲. کلیلە بەفر ☚ ۱. صافی ۲. بهمن

**سافی / safî**/: ناو. ۱. دڵپاکی ۲. پاڵوێنە ۳. لووسی؛ بێگنجی ☚ ۱. پاکدلی ۲و۳. صافی

**سافیلکە / safîlke**/: ☜ ساویلکە

**ساڤ / sav**/: ناو. ئالامەت؛ پەسیو ☚ زُکام

**ساڤا / sava**/: ☜ ساوا

**ساڤار / savar**/: ☜ ساوار

**ساڤاردان / savardan**/: ناو.[پلار] گەدە؛ زگ ☚ انبان؛ شکم

**ساڤالۆک / savalok**/: ناو. منداڵی تازەزاوی جوانکیلە ☚ نوزاد دوستداشتنی

**ساڤایی / savayî**/: ☜ ساوایی

**ساڤدار / savdar**/: ئاوەڵناو. سامناک؛ سامدار؛ بە هەیبەت ☚ سهمناک

**ساق**[۱] **/ saq**/: ناو. ۱. لاسکی گیا و دار ۲. جیقنە؛ ڕیقنە ۳. تەپەگووی سەگ و ڕێوی ٤. بەلەکپێچی بە بەن چندراو ☚ ۱. ساقەی گیاه و درخت ۲. پیخال ۳. مدفوع سگ یا روباه ۴. ساقپیچ پشمی

**ساق**[۲]: ☜ ساخ

**ساق**[۳]: ئاوەڵکار. بە ساقی؛ بە خێری؛ بە یەکجاری ‹ساق نایە دەمی!› ☚ دُرُسته

**ساقبەند / saqbend**/: ☜ پووزەوانە

**ساقپەڕ / saqpeř**/: ناو. پینەی بۆ جوانی بە سەر کراسدا درواو ☚ وصلەی زینتی لباس

**ساقپێچ / saqpêç**/: ناو. دۆلاغ؛ پووزەوانە؛ ساقپێچ ☚ ساقپیچ

**ساقوسلامەت / saqûs(i)łamet**/: ☜ ساخوسەلامەت

**ساقوسەلیم / saq û selîm**/: ☜ ساخوسەلامەت

**ساقۆ / saqo**/: ☜ پاڵتاو-۱

**ساقۆت / saqot**/: ☜ ساقۆتە

**ساقۆتە / saqote**/: ناو. ساقۆت: ۱. ساقۆڵ؛ پارچە گۆشتی بە ئێسقانەوە ۲. ئێسکی ئەژنۆ ☚ ۱. قطعه گوشت با استخوان ۲. استخوان زانو

**ساقۆڕ / saqoř**/: ناو. سەوەتەی زۆر گەورە بۆ گیا و کا کێشان ☚ سبد بزرگ کاهکشی

**ساقۆڵ / saqoł**/: ناو. ۱. ☜ ساقۆتە -۱ ۲. قەرتاڵەی ترێ چنین ۳. ☜ ساکول ☚ ۱. ☜ ساقۆتە-۱ ۲. سبد میوەچینی ۳. ☜ ساکول

**ساقە / saqe**/: ☜ سەدەقە

⊡ **بە ساقەی کەسێک بوون**: بەلاگەردانی کەسێک بوون. هەروەها: **کردنە ساقەی کەسێک** ☚ دور کسی گشتن

**ساقەتە / saqete**/: ناو. ۱. کۆتەرەی دار ۲. لاسکی گیا ☚ ۱. تنەی درخت ۲. ساقەی گیاه

**ساقەتەسوورە / saqetesûre**/: ناو. زەرنەقووتە؛ بێچووە باڵندەی پەڕ دەرنەهاتوو ☚ جوجە گنجشک پر درنیاوردە

**ساقەچەرم / saqeçerm**/: ناو. ۱. چەرمی سەرملی باڵندە کە دایدەماڵن ۲.[کینایە] ئازار؛ جەزرەبە ☚ ۱. پوست سر پرندە ۲. شکنجه

**ساقەسەری / saqeserî**/: ناو. ساقەی سەر: ۱.

بەلاگەردان؛ ئەوەی لە پێناوی ساخی و بێوەی بوونی کەسێک بە دەوری سەریدا دەگێڕن و دەیکەن بە خێر ٢. [کینایە] ئەوەی کە بە خۆڕایی بە کەسێکی دەدەن ☰ ١و٢. صدقەسری

▣ **ساقەسەری/ ساقەی سەری کەسێک/ شتێک**: بە بۆنەی کەسێ/ شتێکەوە ‹ساقەی سەرت شکاتی لێ مەکە!› ☰ صدقەی سر کسی/ چیزی

**ساقی** / saqî/: ناو. ١. ☜ **ساخی** ٢. مەیگێڕ ‹سا ئیسە ساقی جەمین جام جەم/ وادەی ئاماتەن وە بان دیدەم «مەولەوی»› ☰ ١. ☜ **ساخی** ٢. ساقی

**ساقینامە** / saqîname/: ناو. مەسنەوییەک لە بەحری موتەقاریب کە تێیدا شاعیر ڕووی قسەی لە مەیگێڕە و پێڕای دەربڕینی هەست و ویستی خۆی، هانی دەدا بادەکەی بگێڕێ ☰ ساقینامە

**ساقیوباقی** / saqî û baqî/: ناو. [کینایە] سەودا و مامەڵە ☰ دادوستد

**ساک** / sak/: ناو. ١. ساک؛ چیمانی؛ جانتا؛ چەنتە ٢. پالاغ؛ گوێلکی گامێش ☰ ١. ساک ٢. گوسالەی گاومیش

**ساکار** / sakar/: ئاوەڵناو. ١. سادە؛ بێنەخش و خەت ٢. سادە و دڵساف ‹پیاوێکی ساکارە، فڕوفێڵ نازانێ› ٣. ئاسان؛ بێ دژواری بۆ تێگەییشتن ‹سا کە ئەو کارە وەها ساکارە/ مەرگە میوانی گەدا و خوونکارە «سوارە»› ٤. پاک؛ خاوێن و بێخەوش ‹عیشقێکی ساکار و مندالانە› ☰ ١. سادە؛ بدون نقش و نگار ٢. سادە و پاکدل ٣. آسان ۴. پاک

**ساکارۆز** / sakaroz/: ناو. شەکری چەوەندەر و قامیش ☰ ساکارُز

**ساکاری** / sakarî/: ناو. سادەیی؛ دۆخی بێزەرق و بەرق و زەمبەر ☰ سادگی

**ساکارین** / sakrîn/: ناو. ماکێکی سپی بلوورین کە لە ئاودا دەتوێتەوە و ٤٠٠ ئەوندەی شەکر شیرینە و لە جێی شەکر بە کار دەبرێ ☰ ساکارین

**ساکت** / sakit/: ئاوەڵناو. کپ؛ بێدەنگ؛ خپ ☰ ساکت

**ساکسیفون** / saksîfun/: ناو. سازێکی بازەنی وەک زوڕنایە بە دوگمەکانی دەژەنرێ ☰ ساکسیفون

**ساکن** / sakin/: ئاوەڵناو. ١. مەند؛ نەجووڵ؛ بێخوست ٢. ئارام؛ دامرکاو ‹دەمەکەت بێنە، بینە ناو دەمم/ دەبا ساکن بێ دڵەی پڕخەمم «فولکلۆر»› ☰ ١. ساکن ٢. آرام

**ساکنای** / saknay/: ☜ **سەکنین**

**ساکوڵ** / sakul/: ناو. ساقۆڵ؛ باسک و قۆڵ ☰ ساعد و بازو

**ساکوڵ** / sakuł/: ئاوەڵناو. کووڕ؛ قووڵ؛ قویل ☰ گود

**ساکۆ** / sako/: ناو. ١. چیای ڕووتەن ٢. ☜ **پاڵتاو** ٣. دکە؛ ڕووبەرێکی بەرز و تەخت بۆ لە سەر دانیشتن ☰ ١. کوه لخت از گیاه ٢. ☜ **پاڵتاو** ٣. سکو

▣ **ساکۆی کەسێ سیا بوون**: [مجاز] داهاتووی کەسێ ڕوون نەبوون ☰ آیندەی کسی روشن نبودن

**ساکۆڵ** / sakol/: ☜ **ساکۆڵ**

**ساکۆڵ** / sakoł/: ئاوەڵناو. ساکۆل؛ قووڵ؛ نووق؛ کووڕ ☰ ژرف

**ساکۆڵی** / sakołî/: ناو. قووڵایی ☰ عُمق؛ گودی

**ساکەتە** / sakete/: ئاوەڵناو. خڕایی و زەقایی دووگی مەڕ و بەران ☰ برجستگی دُنبەی گوسفند

**ساکەدەشت** / sakedeşt/: ناو. ساکەگۆڕ؛ گۆڕەپان؛ دەشتی پان و بەرین ☰ دشت وسیع

**ساکەگۆڕ** / sakegoř/: ☜ **ساکەدەشت**

**ساکیای** / sakyay/: چاوگ. داسەکین؛ هەدا دان ☰ آرام گرفتن

**ساگات** / sagat/: ☜ **سێبەر**[1]**ـ١**

**ساگوور** / sagûr/: ناو. پارشێو؛ نانی بەرەبەیانی ڕۆژووگر ☰ سحری

**ساگەوان** / sagewan/: ناو. مالۆس؛ بەرازی مێ ☰

خوک ماده

**سال / sal/**: ناو. ١. ☜ **ساڵ** ٢. وشتروان؛ سالڤان؛ سارەوان ٣. بەردی لووس و درێژووکە و لەبار بۆ کێلی قەبر ⇐ ١. ☜ **ساڵ** ٢. ساربان ٣. سنگ مناسب برای سنگ مزار

**سالاد / salad/**: ناو. سالاد؛ زەلاتە ⇐ سالاد

**سالار[1] / salar/**: ناو. سەرۆک؛ مەزن؛ گەورەی کۆمەڵ ‹سالاری لەشکر› ⇐ سالار

**سالار[2]**: ئاوەڵناو. مەزن؛ میر؛ خاوەن خوو و خدەی بەرز ‹پیاوێکی سالارە› ⇐ سالار

**ـ سالاری / salarî-/**: پاشەوشە. گەورەیی؛ مەزنی ‹باوکسالاری› ⇐ ـ سالاری

**سالامبور / salambur/**: ناو. پێستەی هەلاڵدراوی چوارپێیان کە ئامادەی خۆشە کردنە ⇐ سالامبور

**سالبۆری / salborî/**: ئاوەڵناو. تەواو پیر؛ زۆر بە تەمەن ⇐ سالخوردە

**سالخ / salix/**: ناو. سالغ؛ خەبەر؛ ئاگەداری ⇐ آگهی

**سالخم / salxim/**: ناو. هێشووەترێی گەورە ⇐ خوشەی بزرگ انگور

**سالغ / saliğ/**: ☜ **سالخ**

**سالڤان / salvan/**: ☜ **سارەوان**

**سالکی / sal(i)kî/**: ئاوەڵناو. سالانە ⇐ سالیانە

**سالم[1] / salim/**: ☜ **سالمە**

**سالم[2]**: ئاوەڵناو. ساخ؛ سلامەت ⇐ سالم

**سالمە / sal(i)me/**: ناو. سالم؛ سارمە؛ سەعلەب؛ سەهلاب؛ گیایەکە بنەکەی بۆ دەقی چیت بە کار دێ، بەرێکی وەک بادام دەگرێ، دەیهاڕن و بۆ خەست کردنەوەی بڕێ خواردەمەنی (وەک شەربەت، بەستەنی و ...) بە کار دێت ⇐ گیاه سلمە؛ ثعلب

**سالوق / saluq/**: ناو. کولک: ١. وردە پەڕی باڵدار ٢. وردە خوری بنەوە ⇐ ١و٢. کُرک

**سالۆخ[1] / salox/**: ☜ **سۆراغ**

**سالۆخ[2]**: ئاوەڵناو. سالۆغ؛ ئاگا ⇐ آگاه

**سالۆر / salor/**: ئاوەڵناو. ژیر؛ بەئاوەز؛ خاوەن فام ⇐ فهمیدە

**سالۆزی / salozî/**: ناو. سالۆسی؛ ڕیاکاری ⇐ سالوسی

**سالۆسی / salosî/**: ☜ **سالۆزی**

**سالۆغ / saloğ/**: ☜ **سالۆخ[2]**

**سالۆن / salon/**: ناو. سالۆن؛ هۆڵ؛ تەلار؛ هۆدەی گەورە ⇐ سالُن

**سالووت / salût/**: ناو. سالوویت؛ دەوەنی لە دەشتایی نێوان دوو کێودا ⇐ بوتەی جلگەای

**سالووز / salûz/**: ئاوەڵناو. شارەزا؛ کارزان ⇐ ماهر

**سالوول / salûl/**: ناو. سللول؛ ژووری تاکەکەسی زیندان ⇐ سلول انفرادی

**سالوویت / salûyt/**: ☜ **سالووت**

**سالەک / salek/**: ناو. نەخۆشییەکی چڵکی و درێژخایەنی پێستە کە بە هۆی پێوەدانی مێشوولەی ئالوودە بە مشەخۆرێک بە ناوی «لیشمانیا»وە بەدی دێت ⇐ سالک

**سالیس / salîs/**: ناو. پەیاغی لووس و حولی ⇐ چوبدست کلفت و صاف

**سالین / salîn/**: ☜ **سالانە[1]**

**سالیۆن / salyon/**: ناو. کاشەمە؛ کاشمە ⇐ کرفس کوهی

**ساڵ[1] / sał/**: ناو. سال؛ سالە: ١. یەکەی پێوانی زەمان بەرانبەر بە سووڕێکی زەوی بە دەوری خۆردا، کە بریتییە لە سێسەد و شەست و پێنج شەو و ڕۆژ و نزیک پێنج ساعەت و چل و نۆ خولەک (ساڵی هەتاوی) ٢. یەکەی پێوانی زەمان بەرانبەر دوازدەجار خولی مانگ بە دەوری زەویدا، کە بریتییە لە سێسەد و پەنجا و چوار ڕۆژ (ساڵی مانگی) ٣. تەمەن؛ یەکەی پێوانی ژیانی

کەسێ یان شتێک ‹پەنجا ساڵی تەمەنە› ٤. مێژوو؛ زەمانی ڕووداوێک بە پێی سەرەتایەکی مێژوویی ‹ڕاپەڕینی شێخ مەحموود ساڵی ١٩١٩ی زایینی ڕووی دا› ٥. خولێکی چالاکی دامەزراوەیەک لە درێژایی ساڵێکدا ‹ساڵی خوێندنی ٩٥-٩٤ ڕشتەی زمان و وێژەی کوردی لە زانستگای کوردستان کرایەوە› ٦. پۆل؛ پلەک یان پایەی قوتابی یان خوێندکار لە دامەزراوەیەکی فێرکاریدا ‹ساڵی سێهەمی کیمیا› ٧. سەرجەمی ژمارەگەلی گۆڤار یان ڕۆژنامەیەک لە مەودای ساڵێکدا ٨. *[مەجاز]* ساڵڕۆژ؛ ساڵهات؛ ساڵەهات؛ ڕۆژێ کە یەک یان چەند ساڵێ لەوەپێش ڕووداوێکی تێدا ڕووی داوە ‹بەیانی ساڵی بابمانە› ≡ ١تا٨ سال

▣ **ساڵ بۆ ساڵ:** ١. ئەم ساڵ بۆ ئەو ساڵ؛ بە مەودای ساڵێک ‹ساڵ بۆ ساڵ نەماندەدی› ٢. ساڵ لەگەڵ ساڵ؛ ئەمساڵ لە چاو ساڵی پار ‹ساڵ بۆ ساڵ خراپتر دەبێ› ≡ ١. سال تا سال ٢. سال به سال

**ساڵ دوازدە مانگ:** دوازدە مانگەی خودا؛ تەواوی ساڵ ‹ساڵ دوازدە مانگ خەریکی نوێژخوێندنە!› ≡ دوازده ماه سال

**ساڵ لەگەڵ ساڵ:** ☜ **ساڵ بۆ ساڵ ـ٢**

**ساڵی پڕ:** ☜ **ساڵی کەبیسە**

**ساڵی تیشکی:** ☜ **ساڵی نوری**

**ساڵی خوێندن:** ماوەیەک لە ساڵدا کە دەزگایەکی پەروەردە کار دەکا ≡ سال تحصیلی

**ساڵی ڕۆژی:** ☜ **ساڵی هەتاوی**

**ساڵی زایینی:** ساڵێکی هەتاوی کە لە سەرەتای ژانوییەوە (١١ی بەفرانبار) دەستپێدەکا ≡ سال میلادی

**ساڵی کۆچی. مانگی:** ساڵی هەیڤی ئیسلامی کە لە هەوەڵی موحەڕڕەمەوە دەسپێدەکا ≡ سال هجری قمری

**ساڵی کۆچی . هەتاوی:** ساڵی ئێرانی، کە بە نەورۆز (خاکەلێوە) دەسپێدەکا ≡ سال هجری خورشیدی

**ساڵی کەبیسە:** ساڵی پڕ؛ ساڵی ٣٦٦ ڕۆژە؛ ساڵێ کە ڕەشەمەی سی ڕۆژە ≡ سال کبیسه

**ساڵی ماڵی:** دوازدە مانگی پەساپەس لە سەرەتایەکی دڵخوازەوە کە بۆ خولێکی حیسابداری ڕەچاو دەکرێ ≡ سال مالی

**ساڵی مانگی:** ساڵی هەیڤی؛ مەودای زەمانی دوازدە جار گەڕانی دوا بە دوای مانگ بە دەوری زەویدا (نزیک بە ٣٥٤ ڕۆژ) ≡ سال قمری

**ساڵی نوری:** ساڵی تیشکی؛ مەودایەک کە نوور لە ماوەی یەک ساڵدا دەیپێوێ (مەودایەکی یەکجار درێژە، بەرامبەر بە $9{,}461 \times 10^{12}$ کیلۆمیتر) ≡ سال نوری

**ساڵی هەتاوی:** ساڵی ڕۆژی؛ مەودای دوو بگاری ڕواڵەتی لە شوێنیەکی خۆر لە خاڵی بەهارییەوە (بەرانبەری ٣٦٥ ڕۆژ و ٥ سەعات و ٤٨ خولەک و ٤٦ چرکە) ≡ سال خورشیدی

▣ **ساڵ درەنگ بوون:** ساڵ گەیشتنە کۆتاییەکانی ‹کە ساڵ درەنگ بوو، هەرد گەرم دادێ و هەڵمێ دەکا «هێمن»› ≡ سال به اواخر رسیدن

**ساڵی کەسێک هاتنەوە:** تێپەڕینی ساڵێک بە سەر مردنی کەسێکدا ‹ئەوڕۆ ساڵی بابم هاتەوە› ≡ سالمرگ کسی شدن

**بە ساڵدا چوون:** پیر بوون ≡ پیر شدن

ـ **ساڵ**[٢]: پاشەوشە. ١. تەمەن؛ عومر ‹منداڵێکی کەمساڵ بۆتە بەرپرس!› ٢. ـ ساڵ؛ ساڵێک بە تایبەتمەندییەکی دیارەوە ‹وشکەساڵ؛ تەڕەساڵ› ≡ ١و٢. ـ سال

**ساڵاد** /saład/: ☜ **سالاد**

**ساڵان**[1] / sałan/: ئاوەلکار. ساڵیان؛ لە چەند ساڵی ڕابردوودا ‹ساڵان وا زوو گەرمی نەدەکرد› ☰ در سال‌های گذشته

**ـ ساڵان**[2]: پاشەوشە. ـ ساڵە ‹سێ‌ساڵان؛ چەندساڵان› ☰ ـ ساله

**ساڵانە**[1] / sałane/: ئاوەلناو. ساڵیانە؛ ساڵکی؛ ساڵین؛ پێوەندیدار بە ساڵەوە ‹داهاتی ساڵانە› ☰ سالانه

**ساڵانە**[2]: ئاوەلکار. ساڵیانە: ١. لە ساڵدا؛ ساڵێ ‹ساڵانە چوار جار دەچمە هەولێر› ٢. لەسەرخۆ؛ ساڵدانە ـ ساڵدانە؛ چۆنیەتی ڕۆیشتن بە تەنبەڵی ☰ ١. سالانه ٢. سلانه ـ سلانه

**ـ ساڵانە**[3]: پاشەوشە. ـ ساڵە ‹پێنج‌ساڵانە› ☰ ساله

**ساڵاو** / saław/: ناو. تەڕەساڵ؛ ساڵێ کە ئاوی زۆر بێ ☰ سال پُر باران

**ساڵاوەر** / saławer/: ناو. داهاتی ساڵ؛ دەرامەتی ساڵانە ☰ درآمد سال

**ساڵبڕ** / sałbiř/: ناو. ساڵ؛ ساڵیانە؛ ساڵەهات؛ ساڵهات؛ ساڵەوەخت؛ ساڵوەگەڕ؛ ساڵڤەگەڕ؛ کاتی تێپەڕینی یەک یان چەند ساڵ لە ڕووداوێک ☰ سالگرد

**ساڵبژێر** / sałb(i)jêr/: ناو. ئەوەی کە لەمەڕ ڕووداوە گرنگ و دیاردەکانەوە لە هەر ساڵدا ئاگاداری دەدا ☰ سالشمار

**ساڵبەساڵ** / sałbesał/: ئاوەلکار. ساڵ لە دووی ساڵ؛ هەموو ساڵێک ☰ هرساله

**ساڵپێو** / sałpêw/: ناو. ساڵنامە؛ ساڵنوما؛ ڕۆژژمێر؛ ڕۆژمێر؛ ڕووژشمار؛ کتێبێ کە ڕووداوی ساڵێکی تێدا دەنووسرێ ☰ سالنامه

**ساڵح** / sałiḧ/: ئاوەلناو. پیاوچاک؛ دیندار ☰ صالح

**ساڵدانە ـ ساڵدانە** / sałdane sałdane/: ئاوەلکار. هێواش ـ هێواش ☰ سلانه ـ سلانه

**ساڵڕۆژ** / sałřoj/: ناو. ساڵەهات ☰ سالروز

**ساڵژمێر** / sałj(i)mêr/: ناو. ساڵبژێر؛ ئەوەی (بەتایبەت نووسراوە) کە لەمەڕ ڕووداوانی دەسنیشان لە هەر ساڵدا ئاگاداری دەدا ‹ساڵژمێری ژیانی هێمن› ☰ سالشمار

**ساڵڤەگەڕ** / sałvegeř/: ☚ **ساڵوەگەڕ**

**ساڵمەند** / sałmend/: ئاوەلناو. بەتەمەن؛ کاڵ؛ زۆرهان؛ بەساڵاچوو ☰ پیر

**ساڵنامە** / sałname/: ☚ **ساڵپێو**

**ساڵنوما** / sałnuma/: ☚ **ساڵپێو**

**ساڵنەساڵ** / sałnesał/: ئاوەلکار. ساڵێک نە ساڵێکی تر ‹ساڵنەساڵ گەنم دەکێڵین› ☰ یک سال درمیان

**ساڵوەگەڕ** / sałwegeř/: ناو. ساڵەهات؛ ساڵڤەگەڕ ☰ سالگرد

**ساڵۆن** / sałon/: ☚ **ساڵان**

**ساڵە**[1] / sałe/: ☚ **ساڵ**[1]

**ـ ساڵە**[2]: پاشەوشە. بە تەمەن بە پێی ساڵ ‹یەکساڵە› ☰ ـ ساله

**ساڵەوساڵ** / sałewsał/: ئاوەلکار. ساڵ لەگەڵ ساڵ؛ ساڵان لە دوای یەک ‹ساڵەوساڵ پێش دەکەوت› ☰ سال به سال

**ساڵەوەخت** / sałewext/: ☚ **ساڵبڕ**

**ساڵەهات** / sałehat/: ☚ **ساڵبڕ**

**ساڵهات** / sałhat/: ☚ **ساڵبڕ**

**ساڵیان** / sał(i)yan/: ☚ **ساڵان**[1]

**ساڵیانە**[1] / sał(i)yane/: ☚ **ساڵبڕ**

**ساڵیانە**[2]: ☚ **ساڵانە**

**ساڵێ** / sałê/: ئاوەلکار. لە ساڵدا؛ لە ساڵێکدا ‹کرێکاران ساڵێ یەک مانگ دەچنە پشوو› ☰ سالی

**سام** / sam/: ناو. ١. ساو؛ ترس؛ خۆف ‹سامی لە خوێندن شکاندم› ٢. ☚ **سێو ـ ١** ☰ ١. هیبت؛ مهابت ٢. ☚ **سیو ـ ١**

▣ **سام شکان:** ترس شکان ‹کە سامم شکا بابم

نادرمیه سابلاخ تا له مەدرەسەی دەولەتی بخوێنم «هێمن»» ☰ ترس ریختن

**سام کردن:** ترسان ☰ ترسیدن

**ساماریوم** / samaryum/: ناو. توخمێکی کیمیایی کانزایی له دەستەی لانتانیدەکان بە ژمارەی ئەتۆمی ٦٢ و کێشی ئەتۆمی ١٥٠,٤، خۆڵەمێشی و بە خوێگەلی سەوز و چێرەییەوە کە لە دروست کردنی شیشەی چاویلکەدا بە کار دێ ☰ ساماریُم

**سامالْ** / samał/: ئاوەڵناو. بێ‌هەور؛ ساف (ئاسمان) ☰ صاف (آسمان)

◘ **سامالْ کردن:** ڕەوینەوەی هەوران لە ئاسمان ☰ پراکندن ابرها

**سامالْسا** / samałsa/: ئاوەڵناو. یەکدەست؛ ساف و لووس ‹بەفر، شاخ و هەردی سامالسا کردووە› ☰ صاف و یکدست

**سامالە** / samałe/: ناو. کاری ساف کردنی شێوەرد ☰ عمل صاف کردن شُخم

◘ **سامالە کردن:** خێشک لە شێوەرد دان ☰ صاف کردن شُخم

**سامالی** / samałî/: ناو. ساهی؛ دۆخی هەور نەبوون بە ئاسمانەوە ☰ صافی آسمان

**سامان** / saman/: ناو. ١. دارایی؛ دەوڵەت ٢. هێمنی و ئارامی ٣. ڕێکوپێکی؛ تەکووزی ٤. ڕادە؛ ئەندازە ‹من فامم یەکسەر جە دەس وەردابێ/ شەوق بێ سامان تۆ لێم سەر دابێ «مەولەوی»› ☰ ١. دارایی ٢. امنیت؛ امان ٣. نظم ۴. حدّ؛ اندازه

◙ **سامانی سروشتی:** دارایی و سەرچاوەگەلی سروشتی وەک (نەوت، گاز، کان، ئاو و...) ☰ منابع طبیعی

**سامانی نەتەوەیی:** دارایی و سەرمایەکانی خەڵکی نەتەوەیەک ☰ منابع ملی

◘ **سامان دان:** تەکووز کردن؛ ڕێکوپێک کردن ☰ نظم دادن

**ساماندار** / samandar/: ئاوەڵناو. دارا؛ دەوڵەمەند ☰ ثروتمند

**سامانسا** / samansa/: ئاوەڵناو. [کینایە] پلیشاوە؛ پانەوەبوو بە سەر زەویدا؛ تەخت وەک زەوی لێ هاتوو ‹من خۆ پای خەمان سامانسام کەردەن/ دەک بمرم هانات بە من ئاوەردەن! «مەولەوی»› ☰ له و لَورده

**سامانگە** / samange/: ناو. خەزێنە؛ سندووقی پارە و پووڵ ☰ گنجینه

**سامانە** / samane/: ناو. دەزگا؛ کۆئەندام؛ گرۆیەک لە شت، بابەت یان دیاردەی پێکەوەگیری ڕێکوپێک کە کۆمەڵەیەک پێک دێنن ☰ سیستم

**سامتۆر** / samtor/: ☜ **پاڵتاو-١**

**سامتی** / sam(i)tî/: ☜ **سامتین**

**سامتیک** / samtîk/: ☜ **سامتین**

**سامتین** / samtîn/: ناو. سامتی؛ سامتیک؛ جۆرێ دەزووی قایم و بریقەدار ☰ نوعی نخ برّاق و مُحکم

**سامدار** / samdar/: ئاوەڵناو. ١. سامناک؛ جێگەی ترس ٢. بەهەیبەت؛ بەسام ☰ ١. ترسناک ٢. باهیبت

**سامناک** / samnak/: ☜ **سامدار-١**

**سامنج** / saminc/: ئاوەڵناو. سمنج؛ بەگێرە و سەرسەخت ☰ سِمِج؛ لجباز

**سامۆتک** / samotik/: ناو. ١. ڕەشایی لە دوورەوە؛ تارمایی ٢. ☜ **سامۆرتە** ☰ ١. شبح؛ سیاهی از دور پیدا ٢. ☜ **سامۆرتە**

**سامۆتە** / samote/: ☜ **سامۆرتە**

**سامۆرتە** / samorte/: ناو. سامۆتک؛ سامۆتە؛ سیمۆت؛ سیمۆتە؛ کەژوو؛ ئاڵقە و بەندی پاشکۆی زین ☰ فتراک

**سامور** / samûr/: ☜ **سمۆرە -١**

**سامە** / same/: ناو. ١. پەیمان؛ مەرج؛ قەرار ٢. وام؛ واو؛ قەرز؛ دەس‌قەرز ٣. پەناگا؛ داڵدە؛ پەسیو

⌨ ۱. پیمان ۲. وام ۳. پناهگاه

**سامی** / samî/: ناو. ۱. بەشێکی گەورە لە مەردمی سپی پێست، بریتی لە عەرەب، جوولەکە، ئاشووری، ئاکەدی کۆن، کەنعانی و بەشێ لە خەڵکی حەبەشە ۲. لقێک لە زمانی ئەو خەڵکانە کە پێکەوە نزیکن، وەکوو عەرەبی، عیبری، ئاشۆری و حەبەشی ⌨ ۱و۲. سامی

**سامیتی** / samîtî/: ☜ **سامیتیل**

**سامیتیل** / samîtîl/: ناو. سامیتی؛ بەن کەڵەوە؛ بەن کەڵەمە؛ بەنێ کە دوو کەڵەوەی ملی گاجووت بە نیرەوە گرێ دەدا ⌨ بند چنبرەی گردن گاو

**سامیر** / samîr/: ناو. ۱. جۆرێ هەرزن ۲. جۆرێ لوورک؛ جۆرێ ژاڵە ⌨ ۱. نوعی ارزن ۲. نوعی خرزهره

**سامیری** / samîrî/: ئاوەڵناو. نیوەدەوڵەتی؛ تایبەتمەندی دەزگا یان ڕێوشوێنێک کە پەیوەندی دەگەڵ دەوڵەت هەیە و تەواویش دەوڵەتی نییە ⌨ نیمەدولتی

**سان**[1] / san/: ناو. ۱. سوڵتان؛ نازناوی میرانی هەورامان ۲. تەپاڵەدەشتی ۳. ڕەوتی ڕانانی لەشکر ٤. هەسان؛ بەردی لووسی چەقۆ و تیخی‌تر تیژ کردن ٥. سێبەر؛ سێوەر ‹سان دار بی خوەشە کەوماری نەوێ/ دلداری خوەشە، بەوکاری نەوێ «فولکلۆر»› ٦. ڕێورەسمێ کە تێیدا کۆمەڵێکی (زۆرتر) چەکدار، بە ڕیز و تەکووز ڕادەوەستن هەتا سەرکردە یان بالادەستێک بە بەردەمیاندا تێپەڕێ ۷. هۆزی ڕەش‌پێستی باشووری ئەفریقا (زۆرتر دانیشتووی بووتسوانا) ⌨ ۱. سان؛ لقب اُمرای اورامان ۲. سرگین خشک ۳. سان؛ رژه ۴. فسان؛ سنگ چاقو تیزکنی ۵. سایه ۶ سان ۷. سان؛ بوشمن

◻ **سان بەستن**: ڕیز بەستن؛ بە ڕیز بوون ⌨ صف بستن

**سان دیتن**: بەشداری‌کردن دە ڕێورەسمی ساندا، بیستنی گوزارشی سەرکردە و تێپەڕین لە بەرانبەر کەسانێکەوە کە لە سەر هەست ڕاوەستاون ⌨ سان دیدن

• **سان**[2]: پاشگر. ۱. ـ ستان ‹عەجەمسان؛ دارسان؛ کێفسان› ۲. ئاسا؛ گۆر؛ چەشنی ‹یەکسان؛ کێشسان› ⌨ ۱. ـ ستان ۲. ـ سان

**سانا**[1] / sana/: ئاوەڵناو. ئاسان؛ هاسان؛ نە دژوار ⌨ آسان

**سانا**[2]: ئاوەڵکار. ئاسان؛ هاسان؛ نە دژوار ‹دژوار ژیا و سانا کوژرا! «شێرکۆ»› ⌨ آسان

**سانابەر** / sanaber/: ناو. ئاسانسۆر ⌨ آسانسور

**ساناکاری** / sanakarî/: ☜ **ئاسانکاری**

**سانالە** / sanałe/: ناو. مشتاغ؛ مەشتا؛ جێگەی میوە هەڵخستن لە بەر تاو ⌨ جای خشک کردن میوه در آفتاب

**ساناهی** / sanahî/: ☜ **سانایی**

**سانای** / sanay/: چاوگ. کڕین؛ سەندن ⌨ خریدن

**سانایی** / sanayî/: ناو. ساناهی: ۱. هاسانی؛ ڕەحەتی؛ بێ دژواری ۲. ئاسوودەیی؛ بێ‌خەمی ⌨ ۱. آسانی ۲. آسودگی

**سانت** / sant/: ☜ **سانتی‌میتر**

**سانتریفوژ** / sant(i)rîfûj/: ناو. سانتریفیووژ: ۱. دەزگای جیا کردنەوەی تەنگەلی جۆراوجۆر بە گوێرەی تۆکمەییان بە شێوەی سووڕ دانی زۆر خێرا ۲. جیا کردنەوە، گرتنی ئاو، تەڕایی یان هەڵمی ماکێک بەو کەرستەیە ⌨ ۱و۲. سانتریفوژ

**سانتریفیوژ** / sant(i)rîf(i)yûj/: ☜ **سانتریفوژ**

**سانتەی** / santey/: چاوگ. سەندن ⌨ خریدن

**سانتی‌گراد** / santîg(i)rad/: ناو. پلەکی نیشاندانی دەما کە بە گوێرەی توانەوەی یەخ تا کولانی ئاو، سەد بەش کراوە، سیفر پیشاندەری خالی

بەستران و ١٠٠ پیشاندەری خالی هاتنەکول 🇬 سانتیگراد

**سانتیگرەم** / santîg(i)rem/: ناو. یەکەی کێشان بەرامبەر بە ٠,٠١ گرەم 🇬 سانتیگرم

**سانتیلیتر** / santlîtr/: ناو. یەکەی بارستی تراو بەرامبەر بە ٠,٠١ لیتر 🇬 سانتیلیتر

**سانتیم** / santîm/: ناو. سینتیم: ١. یەک لە سەد؛ سەدیەک ٢. سەدیەکێکی یورۆ (پارەی ئێستاکەی ولاتە یەکگرتووەکانی ئورووپا)، فرانک (پارەی پێشووی فەرانسە و هەندێ لە ولاتانیتر) 🇬 ١. یکصدم ٢. سانتیم

**سانتیمانتاڵ** / santîmantał/: ناوەڵناو. ١. هەستۆک؛ پڕهەست؛ تیژهەست؛ خوێنگەرم ٢. *[سەرزارەکی]* تەڕپۆش؛ لەڤەند؛ ڕازاوە؛ خوشیک؛ وەشدوخت 🇬 ١و٢. سانتیمانتال

**سانتیمیتر** / santîmîtir/: ناو. سانت؛ یەکەی پێوانی درێژایی، بەرامبەر بە ٠,٠١ میتر 🇬 سانتیمتر

◙ **سانتیمیتری چوارپاڵ/ چوارپاڵو**: سانتیمتری چوارپاڵ؛ یەکەی بارست، بەرامبەر بە ٠,٠٠٠٠٠١ میتری چوارپالوو 🇬 سانتیمتر مکعب

**سانتیمیتری چوارگۆش/ چوارگۆشە**: سانتیمتری چوارگۆش؛ یەکەی ڕووبەر، بەرامبەر بە ٠,٠٠٠١ میتری چوارگۆشە 🇬 سانتیمتر مربع

**سانجن** / sancin/: ناو. ١. سانجی؛ کۆڵنج؛ کولنج؛ قۆڵنج؛ قولنج؛ برک؛ شانەڕەقە؛ ئێشی زۆری (زیاتر ناو زگ) بە هۆی گرتن و بەردانی ماسوولکە و دەماری ئەندامێک (وەک: زگ، ڕیخۆلە و...) لە ناو سکدا ٢. ☜ سندان[١]ـ١ 🇬 ١. قولنج ٢. ☜ سندان[١]ـ١

**سانجۆر** / sancor/: ناو. جۆرێ زگئێشەی تووش 🇬 نوعی شکمدرد شدید

**سانجۆل** / sancol/: ☜ ساجور-١

**سانجی** / sancî/: ناو. ١. ☜ سانجن ـ١ ٢. ☜ ساجور-١

**ساندن** / sandin/: ☜ سەندن

**ساندنەوە** / sand(i)newe/: ☜ سەندنەوە

**ساندویچ** / sand(i)wîç/: ناو. نەواڵە؛ نواڵە؛ بابۆڵە؛ باڵۆڵە؛ لەفە؛ لەففە؛ قەپاڵە؛ قەباڵە؛ قەواڵە؛ باسترمە؛ کادک؛ دورووم؛ دورمە؛ لۆت؛ هۆچ؛ تیکە پێخۆری بە نان پێچراو 🇬 ساندویچ

**ساندویچی**[١] / sand(i)wîçî/: ناو. ١. نەواڵەفرۆش؛ بابۆڵەفرۆش ٢. دووکانێ کە ساندویچی تێدا دەفرۆشن 🇬 ١و٢. ساندویچی

**ساندویچی**[٢]: ناوەڵناو. بابۆڵەیی؛ نەواڵەیی ‹نانی ساندویچی› 🇬 ساندویچی

**ساندە** / sande/: ☜ سوانە

**ساندیلکە** / sandîlke/: ناو. سواندولکە؛ سواندۆکە؛ سواندووکە؛ سواندیلکە؛ سیڤاندۆک؛ سیڤاندۆکە؛ سیڤاندیلکە؛ پاساری؛ چێشکە؛ چۆلەکە؛ چویک؛ مەلیچک 🇬 گُنجشک

**سانس** / sans/: ناو. هەر نۆرە شاندانێکی فیلم لە سینەما 🇬 سانس

**سانسکریت** / sansk(i)rît/: ناو. سەنسکریت؛ لە زمانە هیندوو ـ ئێرانییەکان، زمانی کەونارای گەلی ئاریایی هیند 🇬 سانسکریت

**سانسۆر** / sansor/: ناو. کار و ڕەوتی پشکاندنی ڕۆژنامە، گۆڤار، فیلم، شانۆنامە و هەمووجۆرە بلاڤۆکێک بەر لە بلاو بوونەوەی، بۆ بەرگری لە پەرە ساندنی هەواڵ، قسە یان وێنەگەلی دیاریکراو 🇬 سانسور

**سانن** / sanin/: چاوگ. کڕین؛ سەندن 🇬 خریدن

**ساننەوە** / sannewe/: چاوگ. وەئەستاندن؛ وەستاندن؛ ئەستاندنەوە 🇬 بازپس گرفتن

**سانەر** / saner/: ناو. شانەر؛ شێنەر؛ بەڕێکەر 🇬

فرستنده

**سانەوە** / sanewe/: چاوگ. حەسانەوە؛ سیایەوە؛ سەینای ≡ آسودن

**سانەی** / saney/: چاوگ. ستانای؛ ستاندن: ١. وەرگرتن ٢. /مەجاز/ داگیر کردن بە زۆر ≡ ١. گرفتن ٢. غصب کردن

**سانیای** / sanyay/: چاوگ. سەنران ≡ خریده شدن

**سانیلکە** / sanîlke/: ئاوەڵناو. سانیلۆکە؛ ئاسان ≡ آسان

**سانیلۆکە** / sanîloke/: ☜ **سانیلکە**

**سانیە** / san(i)ye/: ناو. چرکە ≡ ثانیه

**ساو**[1] / saw/: ناو. ١. کاری پێدا ساوین؛ لێخستن؛ ڕێخستن ٢. تیژایی دەمی تیخ ٣. ☜ **سێو-١** ٤. ☜ **سام-١** ≡ ١. عمل سودن؛ مالیدن ٢. تیزی لبەی تیغ ٣. ☜ **سێو-١** ۴. ☜ **سام-١**

⊡ **لە ساو دان:** بە هەساندا مالینی تیخ بۆ تیژ کردنی ‹خەریکی دڵنەوازیمی بە چاوی مەرحەمەت زاهیر/ نیهانی بۆ سەرم تیغی برۆیانت لە ساو داوە «سالم»› ≡ فسان بر تیغ مالیدن

**ساو**[2]: ئاوەڵناو. ١. تیژکراو بە سان ٢. سامال؛ بێهەور ‹ئاسمانی ساو› ٣. ساوراو؛ زبری و گرنج لێ ماڵراو ≡ ١. تیز شده با فسان ٢. آفتابی ٣. صاف

**- ساو**[3]: پاشەوشە. ساوراو؛ ساویاگ ‹پلساو، زمساو، هێلەساو› ≡ - سای

**ساوا**[1] / sawa/: ناو. ساڤا: ١. کۆرپە؛ نووزاک؛ لەیر ٢. بەبە؛ چلەدار؛ وەرمەکی؛ منداڵی مرۆڤ تا چل ڕۆژ پاش لە دایک بوون ٣. بەرخ و کار ٤. کاری پێدا ماڵین؛ دەست ڕێخستن ≡ ١و٢. نوزاد ٣. برّه و بُزغاله ۴. مالش

**ساوا**[2]: ئاوەڵناو. ساڤا؛ نۆرەس: ١. تازە ڕسکاو ‹منداڵی ساوا› ٢. کاڵ؛ کرچ؛ خاو؛ تەواو نەگەیشتوو ‹عەقڵی ساوا› ≡ ١. نورس ٢. کال؛ نارس

**ساوار** / sawar/: ناو. ساڤار؛ ساور؛ ساوەر؛ گەنمی کولاوی بە دەستار کراو ≡ بلغور

**ساواز** / sawaz/: ئاوەڵناو. سایواز؛ ڕووهەڵماڵاو؛ ڕووقایم؛ بێشەرم ≡ پررو؛ بی‌حیا

**ساوازە** / sawaze/: ئاوەڵناو. بێدەربەستی ≡ نامُقید

⊡ **ساوازە بوونەوە:** ئاسایی بوونەوە؛ بە بای خەیاڵدا نەهاتن ‹هێندەی کوشتن و مردنی دیوە تەواو ساوازە بۆتەوە و لاش بە سەر یەکدا بکەوێ، پەکی ناکەوێ!› ≡ عادی شدن

**ساواق** / sawaq/: ناو. سەرمای زۆر ‹ساواقی ساڵانەی بەهاری بێولەت/ ساواقی بورجی مارت «شێرکۆ»› ≡ سرمای سخت

**ساواڵە** / sawałe/: ناو. کارژیلە ≡ بُزغاله

**ساواما** / sawama/: ناو. زاوماک؛ مەڕ و بەرخ و بزن و کاریلەی تێکەڵاو ≡ بُز و گوسفند و برّه و بُزغالەهایشان

**ساوان**[1] / sawan/: چاوگ. ساویان: ١. پیاماڵران؛ پێداهاتن؛ لێخران؛ ڕێخران ٢. سوان؛ لووس بوون و کەم کردن لە بەر زۆر دە کار هێنان ≡ ١. مالیده شدن ٢. ساییده شدن

**ساوان**[2]: ناو. دارێکە لە سەر دوو کۆڵەکە ڕایەڵ دەکرێ، جلوبەرگ و کەلوپەلی پێدا هەڵدەواسن ≡ چوبی که بر دو ستون قرار می‌گیرد و رخت بر آن می‌آویزند

**ساوانی** / sawanî/: ☜ **ساوایی-٢**

**ساوای** / saway/: ☜ **ساوین**

**ساوایی** / sawayî/: ناو. ساڤایی: ١. ڕۆژگاری شلکی و تازەڕسکاوی ٢. ساوانی؛ هەستێ کە لە ڕێی دەماری ژێر پێستەوە برێ تایبەتمەندی وەک: ساردی، گەرمی، زبری و نەرمی دەناسێتەوە ≡ ١. دوران پیش از بلوغ ٢. لامسه

**ساوتەی** / sawtey/: ☜ **ساوین**

**ساور** / sawir/: ☜ **ساوار**

**ساورمه / sawirme/**: ناو. ئێزنگ؛ هێزم؛ داری وشکی شکاو بۆ زۆپە 🇮🇷 هیزم

**ساورین / sawrîn/**: ناو. چێشتی شلەساوار 🇮🇷 آش بلغور

**ساورێن / sawrên/**: ☜ سابرین

**ساوڕ / sawiř/**: ناو. ساوڵ؛ ساوڵە؛ سایڵ؛ تارمایی؛ تاپۆ؛ تراوکە؛ دۆلپا؛ تیبا 🇮🇷 شبح

**ساولۆن / sawlon/**: ناو. چەشنێک تەوشی دژەگەن بۆ سڕینەوەی کیم و زووخی برین 🇮🇷 ساولن

**ساوڵ / sawił/**: ☜ ساوڕ

**ساوڵە / sawłe/**: ☜ ساوڕ

**ساون / sawin/**: ☜ سابون

**ساوون / sawun/**: ☜ سابون

**ساوە / sawe/**: ☜ زاف[1]ـ١

**ساوەر / sawer/**: ☜ ساوار

**ساوەری / sawerî/**: ناو. جزیە؛ پیتاکی؛ باجی تایبەت کە ناموسوڵمانان دەبوا بە فەرمانڕەوای موسوڵمانانیان بدایە 🇮🇷 جزیە

**ساوەرین / sawerîn/**: ☜ سابرین

**ساوەساو / sawesaw/**: ☜ سنەسن

**ساوەلەوانی / sawelewanî/**: ناو. سنەسن؛ ساوەساو 🇮🇷 سستی و کاهلی

**ساوەڵ / saweł/**: ناو. شەڵتە؛ داری دووتایی بەرد کێشان، کە دەخرێتە سەر پشتی بارەبەر 🇮🇷 سنگ‌کش چوبین کە بر پشت الاغ گذارند

**ساوی / sawî/**: ناو. چێشت و نانێ کە لە ماڵان کۆی دەکەنەوە 🇮🇷 خوراکی کە از خانەها جمع کنند

**ساویاگ / sawyag/**: ☜ سواو[2]

**ساویان / sawyan/**: ☜ سوان[1]

**ساویاو / sawyaw/**: ☜ سواو[2]

**ساویای / sawyay/**: ☜ سوان[1]

**ساویر / sawîr/**: ناو. ١. ساو؛ مەترسی؛ هەیبەت ٢. گومان؛ تەمژی؛ خەیاڵات 🇮🇷 ١. هیبت ٢. توهُم

**ساویلکە / sawîlke/**: ئاوەڵناو. سایلۆکە؛ سافیلکە؛ سایلۆح؛ سادە؛ سادەلۆک؛ سادەلۆح؛ سادەکار 🇮🇷 سادەلوح

**ساویلکەیی / sawîlkeyî/**: ناو. سادەیی؛ سایلۆحی 🇮🇷 سادەلوحی

**ساوین / sawîn/**: چاوگ. تێپەڕ. //ساویت؛ دەساوی؛ بساوە// سایین؛ سواندن؛ ساوای؛ ساوتەی؛ سوونای؛ سوانن؛ سوانەوە: ١. ساوان؛ ساو دان؛ هەسوون؛ هەسوان؛ سوین؛ سوون؛ سوینەوە؛ هەسین؛ شتێک لە شتێکی‌تر پەیتا ـ پەیتا و بە گوشارەوە خشاندن ‹دەست بە یەکدا ساوین› ٢. ورد کردن؛ هەنوون؛ هاڕین؛ ناوین؛ ناوەی؛ ساو دان؛ قەمشتن؛ شتێک بە هۆی لێکدانی لە پەستا و بە تەوژمەوە، بڕین، ورد کردن یان سوان ‹کەشک ساوین› ٣. پێداهێنان؛ بۆ تێ‌هەڵساوین ‹دەستی چەور بە سەر کەسێکدا ساوین› 🇮🇷 ١. مالیدن؛ سودن ٢. خُرد کردن ٣. سایدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەساوین

**ساوینەوە / sawînewe/**: چاوگ. ١. ورد کردن و کردنە گەرد ٢. هێنان و بردن بە نهێم لە تراودا ‹کەشک ساوینەوە› 🇮🇷 ١. خُرد کردن ٢. در مایعی بر هم زدن

**ساهل / sahil/**: ناو. جنۆکە 🇮🇷 جن

**ساهمەک / sahmek/**: ناو. سام؛ ترس؛ هەیبەت 🇮🇷 هیبت

**ساهی / sahî/**: ناو. ساماڵی 🇮🇷 صافی (آسمان)

**ساهیک / sahîk/**: ناو. تەپاڵە؛ سەنیری پێژراو بۆ سووتەمەنی 🇮🇷 تاپالە

**سای / say/**: ناو. ١. سا؛ سێبەر؛ سێوەر؛ سەهەن ‹غونچەی سۆسەنان جە سای مەخاران/ مانا نە شێوەی خاڵ تەتاران «بێسارانی»› ٢. تاپۆ؛ تارمایی 🇮🇷 ١. سایە ٢. شَبَح

**سایت** / sayt/: ناو. ١. پایەگا؛ بنکە؛ شوێنی دامەزراندنی ڕادار یان سەکۆی مووشەک هاویشتن ‹سایتی مووشەکی› ٢. ماڵپەڕ؛ ناوەندێک بە ناونیشانێکی تایبەتەوە لە ئینترنێتدا ‹ئەم هەواڵە لە سەر سایتی ڕووداو هاتووە› ⚑ ١و٢. سایت

**سایز** / sayz/: ناو. ئەندازە؛ ئەنازە؛ بەر؛ ژمارە؛ ئەندازەی بەرگ و پۆشەن، کڵاو، کەوش و ... ‹ئەم کەوشە سایزی من نییە› ⚑ سایز

**سایسە** / sayse/: ☜ **سواو**[2]

**سایقە**[1] / sayqe/: ناو. سایەقە؛ ساواق؛ سەرما و بەستەڵەک ⚑ سرمای یخبندان

**سایقە**[2]: ئاوەڵناو. سایەقە؛ ساو؛ ساماڵ (زۆتر لە شەوانی ساردی زستاندا) ⚑ صاف (آسمان)

**سایکلۆن** / sayk(i)lon/: ناو. گەردەلوول؛ گێژەڵووکە ⚑ گردباد

**سایکڵ** / saykił/: ناو. چەرخە؛ سووڕ؛ زنجیرەی لە شوێن یەکی دیاردەگەلی دووپاتەیی، لە خاڵێکەوە، تا دێتەوە سەر هەمان خاڵ ⚑ چرخه

**سایلۆخ** / sayloĥ/: ☜ **ساویلکە**

**سایلۆحی** / saulohî/: ناو. سادەیی؛ ساویلکەیی ⚑ سادەلوحی

**سایلۆکە** / sayloke/: ☜ **ساویلکە**

**سایلە** / sayle/: ناو. میوانی؛ چێشتی هێندێک تەڕی ئاردی بۆدراو دەگەڵ ڕۆن ⚑ سیلی

⊡ **وەک سایلەی ساردەوە بو بوون**: زۆر شل و شێواو و بێحاڵ بوون ⚑ بی حال و وارفته بودن

**سایڵ** / sayił/: ☜ **ساوڕ**

**سایمە** / sayme/: ناو. سایمەل؛ جۆرێ نەخۆشی ئاژەڵ و ماڵات ⚑ نوعی بیماری دام

**سایمەل** / saymel/: ☜ **سایمە**

**ساین** / sayn/: ناو. ساو؛ ئاسمانی ساف ⚑ آسمان صاف

**سایواز** / saywaz/: ☜ **ساواز**

**سایە** / saye/: ناو. ١. سا؛ سێبەر؛ سەهەن ‹پەی دڵەی مانیای دەروون مەلالان/ سایە بەستەوە خەیمەی گوڵالان «مەولەوی»› ٢. کاری خوێندنی دەرس بێ حینجە کردن ٣. ژەنگی ئاسن ٤. وشەیەکە لە قوماری پەڕاندا دەگوترێ ٥. باڵاپۆشی بەربازی ژنانە ٦. وشتری نارەسەن ⚑ ١. سایە ٢. عمل خواندن درس بدون تهجی ٣. زنگار آهن ٤. اصطلاحی در بازی ورق ٥. نوعی بالاپوش جلوباز زنانه ٦. شتر بداصل

⊡ **سایەی کەسێ کەم نەبوون**: *[کینایە]* میهرەوانی و پشتیوانی کەسێک بەردەوام بوون ‹نیمە ئاواڵێ لە گۆشەی بێکەسیدا، غەم نەبێ/ چاکە ئەو لێرەش وەفای هەر ماوە، سایەی کەم نەبێ! «هێمن»› ⚑ سایەی کسی کم نشدن

**سایەبان** / sayeban/: ناو. سایەوان: ١. سەیوان؛ هەرچی سای هەیە ٢. *[کینایە]* مرۆی خاوەن چاکە ⚑ ١. سایبان ٢. نیکوکار

**سایەپۆش** / sayepoş/: ناو. کۆڵانی تەنگ کە سەری خانووەکان گەیونەتە یەک ⚑ کوچەی تنگ کە بام خانەها بە هم رسیدە باشد

**سایەچەور** / sayeçewr/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دەهندە و دلۆڤان. بەرانبەر: **سایەوشک** ⚑ بخشندە و مهربان

**سایەد** / sayed/: ئاوەڵناو. نیگابان؛ ئاگادار ‹ڕۆژ تا ئێوارە لە سەری سایەدە و چاوی لێ هەڵناگرێ› ⚑ دیدەبان

**سایەدار** / sayedar/: ئاوەڵناو. پەنادەری لێقەوماوان ⚑ ملجأ و مأوای بینوایان و بی‌پناهان

**سایەربایەر** / sayerbayer/: ناو. وڕاوە؛ وڕێنە ⚑ هذیان

**سایەقە** / sayeqe/: ☜ **سایقە**

**سایەک** / sayek/: ناو. سا؛ سێبەر؛ سایە ⚑ سایە

**سایەوان** / sayewan/: ☜ **سایەبان**

**سایەوسەرمایە** / sayewsermaye/: ناو. دارایی؛ ماڵ و سامان ⚐ دارایی

**سایەوشک** / sayewişk/: ناوەڵناو. *[مەجاز]* ڕژد؛ چرووک؛ چکووس؛ دەسقووچاو. بەرانبەر: **سایەچەور** ⚐ خسیس

**سایی** / sayî/: ناو. ساو؛ ئاسمانی بێهەور ⚐ آسمان صاف

**سایین** / sayîn/: ☚ **ساوین**

**سب** / sib/: ☚ **سبح**

▣ **سب زوو**: ١. بەرەبەیان؛ شەوەکی ٢. سەرەتای ڕۆژێ کە دادێ ⚐ ١. بامداد ٢. فردا صبح زود

**سبا** / s(i)ba/: ناو. بەرەبەیان ⚐ بامداد

▣ **سبا دەرەوین**: کازیوە؛ کازێوە؛ سپیبالا؛ بوولێڵە ⚐ فجر کاذب

**سبات** / s(i)bat/: ناو. ١. ☚ **سپات** ٢. ڕێبەندان؛ دووهەم مانگی زستان ⚐ ١. ☚ **سپات** ٢. ماه دوم زمستان

**سباندە** / s(i)bande/: ☚ **سوانە**

**سبت** / sibt/: ناو. گیایەکی بۆنخۆشە ⚐ گیاهی خوشبو

**سبح**[1] / sibḧ/: ناو. سب؛ سبحە؛ سوح؛ سۆح؛ سبحەینێ؛ سبەینە؛ سبەینێ؛ سبیانێ؛ سوو؛ بەیانی؛ سەرەتای ڕۆژ ⚐ صُبح

**سبح**[2]: ناوەڵکار. سب؛ سبحە؛ سوح؛ سۆح؛ سبحەینێ؛ سبەینە؛ سبەینێ؛ سبیانێ؛ سوو؛ سۆزی؛ لە ڕۆژی داهاتوودا ⚐ فردا

**سبحا** / sibḧa/: ناوەڵکار. سۆزی؛ سبەی؛ سبەینێ؛ سبحەی؛ لە ڕۆژی داهاتوودا ⚐ فردا

**سبحە** / sibḧe/: ☚ **سبح**

**سبحەی** / sibḧey/: ناو. ڕۆژی دوایی ⚐ فردا

**سبحەینان** / sibḧeynan/: ناوەڵکار. سبەینان؛ سبەینێیان؛ بەیانان؛ لە سەرەتای هەر ڕۆژدا ⚐ بامدادان

**سبحەینێ** / sibḧeynê/: ناو. سبەینێ؛ سبیانێ؛ سبێ: ١. ڕۆژی دوایی ٢. بەرەبەیان؛ شەوەکی ⚐ ١. فردا ٢. بامداد

**سبر** / sibr/: ☚ **زبر**

**سبری** / sibrî/: ناو. زبری ⚐ زبری

**سبوور** / s(i)bûr/: ☚ **سپوور**

**سبوق** / s(i)bûq/: ناو. واکس؛ بۆیاخ؛ بۆیاغ؛ ڕۆنێکی خەستی بریقەدار (و ڕەنگی) بۆ بریقە پێخستنی کەوش و کەلوپەلی چەرمی ⚐ واکس

**سبە** / s(i)be/: ناو. سۆزی؛ ڕۆژێ دادێ ⚐ فردا

**سبەتر** / s(i)betir/: ناو. دووسبەی؛ دووسۆ ⚐ پس‌فردا

**سبەی** / s(i)bey/: ناو. سبە؛ بەیانی ⚐ فردا

**سبەیشەوێ** / s(i)bey şewê/: ناو. باناشەو؛ سۆزیشەو ⚐ فرداشب

**سبەینان** / s(i)beynan/: ☚ **سبحەینان**

**سبەینە** / s(i)beyne/: ناو. سبە؛ بەیانی؛ شەوەکی ⚐ فردا

**سبەینێ** / s(i)beynê/: ☚ **سبحەینێ**

**سبەینێیان** / s(i)beynêyan/: ☚ **سبحەینان**

**سبیانێ** / sibyanê/: ☚ **سبحەینێ**

**سبیرۆک** / s(i)bîrok/: ناو. جۆرێ چۆلەکەی بۆر و چکۆلەیە، لە نێو دارستان و بێشەدا هێلانە دەکا ⚐ نوعی گنجشک کوچک

**سبیل** / s(i)bîl/: ناو. ١. ☚ **سمێڵ** ٢. سەبیل؛ ئامرازی تووتن کێشان لە قوڕ ⚐ ١. ☚ **سمێڵ** ٢. چُپُق گِلی

**سبێ** / s(i)bê/: ☚ **سبحەینێ**

**سپ** / sip/: ناوەڵکار. تەواو؛ بێکەم و زیاد ⚐ تمام‌وکمال

**سپا** / s(i)pa/: ناو. سوپا؛ لەشکر ⚐ سپاه

**سپات**[1] / s(i)pat/: ناو. سبات؛ ڕەنگی زەردی ئامال

سپی 🇮🇷 کِرم؛ رنگ کِرمی

**سپات**[٢]: ئاوەڵناو. ١. سبات؛ بە ڕەنگی زەردی ئامال سپییەوە ٢. ☜ **سپاتە** 🇮🇷 ١. کرمی رنگ؛ بە رنگ کِرمی ٢. ☜ **سپاتە**

**سپات**[٣]: پێڕۆ. ← **سەڵتوسپات**

**سپاتە** / s(i)pate/: ئاوەڵناو. سپات؛ سەڵتوسپات؛ سەڵت؛ بێهاوسەر؛ بێماڵ و حاڵ 🇮🇷 مُجرد

**سپاخانە** / s(i)paxane/: ناو. سپاگە؛ سوپاخانە؛ سەربازخانە؛ سەروازخانە؛ جێگەی ژیانی لەشکر 🇮🇷 پادگان

**سپادار** / s(i)padar/: ناو. سەرکردەی لەشکر 🇮🇷 سپهدار

**سپارای** / s(i)paray/: چاوگ. سپاردن ‹بێبەینەت شێوەی شێویان دارۆ/ کەسێ سەر نە ڕای بێبەین نەسپارۆ «بێسارانی»› 🇮🇷 سپردن

**سپارتن** / s(i)partin/: ☜ **سپاردن**

**سپارتی** / s(i)partî/: ☜ **سپاردە**[١]

**سپاردن** / s(i)pardin/: چاوگ. تێپەڕ. //سپاردت؛ دەسپێری؛ بسپێرە// سپارتن؛ ئەسپاردن؛ سپارەی؛ سپارای؛ ئسپارەی: ١. داین؛ شتێک بە ئەمانەت بە کەسێک دان بۆ هەڵگرتن و چاوەدێری لێ کردن ‹ماڵمان سپاردە دراوسێکەمان و هاتین› ٢. کردنی کارێک لە کەسێک ویستن ‹بە کوێخای سپاردبوو مەڕی بۆ بکڕێ› 🇮🇷 ١و٢. سپُردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەسپاردن

**سپاردە**[١] / s(i)parde/: ناو. سپارتی؛ سپارە؛ سپوردە؛ سپەردە؛ ئەسپاردە: ١. ئەوەی بۆ پاراستن بە لای کەس یان ڕێخراوەیێکەوە بە ئەمانەت دادەنرێ ‹ئەی ئەو کەسەی سپاردە بزر ناکەی! ڕۆڵەکانمان بە تۆ ئەسپێرین› ٢. ☜ **سپاردەی بانکی** ٣. بارمتە؛ پارە یان ماڵێک کە بۆ دەستەبەری یان بەڵێن بە جێبەجێکردنی کارێک دەدرێتە لایەنێکی تر 🇮🇷 ١. امانتی ٢. ☜ **سپاردەی بانکی** ٣. سپُردە

▣ **سپاردەی بانکی**: پارەیەک کە لە حیسابێکی بانکی کەس یان ڕێخراوەیەک ڕادەگیردرێ 🇮🇷 سپُردەی بانکی

**سپاردە**[٢]: ئاوەڵناو. سپەردە؛ ئەمانەتی؛ سپێراو 🇮🇷 سپُردە

**سپاردەیی** / s(i)pardeyî/: ناو. سپارەیی؛ ئەسپاردەیی 🇮🇷 سفارش

**سپارنای** / s(i)parnay/: چاوگ. ١. سپاردن ٢. پەساردن 🇮🇷 ١. سپُردن ٢. تکیه دادن

**سپارە** / s(i)pare/: ☜ **سپاردە**[١]

**سپارەیی** / s(i)pareyî/: ☜ **سپاردەیی**

**سپاریای** / s(i)paryay/: چاوگ. ١. سپێردران ٢. پەسێران 🇮🇷 ١. سپُردە شدن ٢. تکیه دادە شدن

**سپاڕانی** / s(i)pařanî/: ناو. لەشکرکێشی 🇮🇷 لشکرکشی

**سپاس** / s(i)pas/: ناو. سوپاس؛ ماڵاڤا؛ دۆخی پێزانین و ڕێز گرتن ‹سپاس بۆ خوا کە ڕاهێنەری جیهانە «هەژار، *قورئان*»› 🇮🇷 سپاس

▣ **سپاسی کەسێ کردن**: دەستخۆشی و ماڵاوایی لە کەسێ کردن ‹زۆر سپاست دەکەم› 🇮🇷 از کسی تشکر کردن

**سپاسالار** / s(i)pasalar/: ناو. سوپاسالار؛ سەرکردەی گەورەی هەموو لەشکر 🇮🇷 سپهسالار

**سپاسکار** / s(i)paskar/: ئاوەڵناو. بەئەمەگ؛ پێزان 🇮🇷 سپاسگزار

**سپاگە** / s(i)page/: ☜ **سپاخانە**

**سپایی**[١] / s(i)payî/: ناو. ١. چەکداری لەشکر ٢. خان؛ ئاغا؛ خاوەن هێزی چەکدار 🇮🇷 ١. سپاهی ٢. ارباب؛ خان

**سپایی**[٢]: ئاوەڵناو. پێوەندیدار یان سەر بە سپا 🇮🇷 سپاهی

**سپایی**[٣]: ئاوەڵکار. ئەسپایی؛ هێدی؛ لەسەرەخۆ 🇮🇷 یواشکی

**سپپی** / sippî/: ☜ **سپێ**

**سپر** / sipr/: ناو. ئالۆ؛ هەڵۆ ☰ عُقاب

**سپڕ . سپڕ** / sipiř sipiř/: ئاوەڵکار. سمڕ ـ سمڕ؛ بەکۆڵـەکەزۆران؛ زۆر زۆران ‹چ سـپڕ ـ سـپڕێکتە! هێندێک لەسەرخۆ بە!› ☰ حالت زور زدن

**سپل** / sip(i)l/: ناو. خاڵخاڵۆکە ☰ کفشدوزک

**سپلوێنک** / sipl(i)wênik/: ناو. داری وشکی لە بەر خۆرەتاو سپی بوو ☰ چوب در آفتاب خشکیدەی سفید شدە

**سپڵ** / sip(i)ł/: ناو. سـوویە؛ سـەپەڵ؛ ئەسـپوول؛ ئسپڵ؛ ئسبڵ؛ ئسپیل؛ فشک؛ دیدک؛ دیدەڕەش؛ پەشـاڕەش؛ شوشـو؛ شمـش؛ خـوش‌خوشـک؛ خـوش‌خوشـکە؛ گـورگـنـەخۆرە؛ خالخالـک؛ فاتەڕەشـک؛ ددان‌خۆشـک؛ تـاڵ؛ ئەنـدامێکی لووئاسا لە سەرووی لای چەپی گەدەوە کە لە نێو بردنی خڕۆکە سوورە پیرەکانی خوێن و دروسـت کردنی خڕۆکەی تازەی لە ئەستۆدایە ☰ طحـال؛ سُپرز

▣ **سپڵی لاورگە**/کینایـە/ ڕەزاگـرانی تووشـی دەست‌هەڵنەگر ☰ مزاحمِ سمج

**سپڵۆ** / sipło/: ☜ **سپڵۆت**

**سپڵۆت**[1] / sipłot/: نـاو. سپڵـۆ؛ سـپە؛ سلـپۆت؛ چوارپێ؛ گەماڵ؛ کسۆک؛ کووچک؛ بەشدار؛ سـە؛ سەگ ☰ سگ

**سپڵۆت**[2]: ئاوەڵناو. سپڵۆ؛ سپڵۆتی؛ سلپۆت؛ سپڵۆک؛ گلاو؛ پیس ‹سەگ سپڵۆتە› ☰ نجس

**سپڵۆتی** / sipłotî/: ☜ **سپڵۆت**[2]

**سپڵۆک** / sipłok/: ☜ **سپڵۆت**[2]

**سپڵە** / sipłe/: ئاوەڵناو. *[پەلار]* سفلـە؛ پـێ‌نـەزان؛ بێ‌سفەت؛ بێ‌ئەمەگ ‹گەرچی تووشی ڕەنجەڕۆیی و حەسـرەت و دەردم ئـەمن/ قـەت لـە دەس ئـەم چەرخە سپڵـە نابـەزم، مـەردم ئـەمن «هـێمن»› ☰ ناسپاس

**سپڵەیی** / sipłeyî/: نـاو. ناشـوکری؛ پـێ‌نـەزانی ☰ نمک نشناسی؛ ناسپاسی

**سپناخ** / sipnax/: ☜ **ئەسپەناخ**

**سپندک** / sipindik/: نـاو. گیایەکـە دەیخـۆن ☰ گیاهی خوراکی

**سپنگ** / s(i)ping/: نـاو. شـنگ؛ شـن؛ ئەسـپنگ؛ ئەسپینگ؛ سپینگ؛ گیایەکی ئـالیکی دووسـاڵان بـە شـیلەی سـپی و چەسـپن، گـەڵای زراڤ و درێژەوە، سەوزەمەنییەکی خۆڕسـک و خـۆراکی کوێستانە ☰ شنگ

**سپوردە** / s(i)purde/: ئاوەڵـناو. ١. ئامانـەتی؛ سپێردراو ٢. لە خاکـدا وەشـێراو ☰ ١. سُپردە ٢. دفن‌شدە

**سپۆن** / s(i)pon/: ناو. ئەسپۆن؛ زروێ؛ کەفکەفۆک؛ بنـە گیایەکـە کـەف دەکـا، جـاران جلیـان پـێ دەشۆرد ☰ چوبک رختشویی

**سپووچک** / s(i)pûçik/: ناو. چەرمێنـەی هێلکـە ☰ سپیدەی تخم‌مرغ

**سپوور** / s(i)pûr/: نـاو. سـبوور؛ سـفوور؛ گەسک‌لێدەری شەقام و کۆڵانان ☰ رُفتگر

**سپووک** / s(i)pûk/: ☜ **سماق**

**سپە** / s(i)pe/: ناو. ١. سپڵۆ؛ سەگ ٢. ☜ **سپێ** ☰ ١. سگ ٢. ☜ **سپێ**

**سپەر** / s(i)per/: ناو. ١. چەپەر؛ خەڵ؛ سەنگەر ٢. ☜ **سپێر-٢** ☰ ١. سنگر ٢. ☜ **سپێر-٢**

**سپەردن** / s(i)perdin/: چاوگ. ئەسـپەردە کـردن؛ ئەسپاردن (بە خاک) ☰ دفن کردن

**سپەردە** / s(i)perde/: ☜ **سپاردە**

**سپەردەی** / s(i)perdey/: چاوگ. سپاردن ‹سـا کـە من بێ تۆ نەسـپەردم ئـەروا/ سـەر نـەنیام نـە سـای ئەلحەد بێ‌پەروا «مەولەوی»› ☰ سپردن

**سپەڕ** / s(i)peř/: ناو. سەگ ☰ سگ

**سپەناغ** / s(i)penağ/: ناو. ئەسپەناخ ☰ اسفناج

**سپەهی** / s(i)pehî/: ئاوەڵناو. ١. جوان؛ خوشیک ٢. باش؛ چاک؛ پەسند ≡ ١. زیبا ٢. پسندیده

**سپەیی** / s(i)peyî/: ئاوەڵناو. زۆر باش ≡ بسیار خوب

**سپەیین** / s(i)peyîn/: ناو. فێڵبازی؛ گزیکاری ≡ نیرنگ

**سپی**[١] / s(i)pî/: ناو. ١. چەرمگ؛ چەرمووگ؛ چەرموو ٢. گیایەکە ٣. سپیایی ٤. ☜ سپێ ≡ ١. سفید ٢. گیاهی است ٣. سفید شیری ۴. ☜ سپێ

**سپی**[٢]: ئاوەڵناو. ١. چەرمگ؛ چەرمووگ؛ چەرموو؛ بە ڕەنگی چەرمگەوە ٢. تۆخڵ لێدارناو ≡ ١. سفید ٢. پوست‌کنده

⊡ **سپی بوون**: ١. چەرمگ بوون ٢. *[کینایە]* ڕەنگ پەڕین ≡ ١. سفید شدن ٢. رنگ باختن

**سپی بوونەوە**: ١. چەرمگەو بوون ٢. ڕەنگ پەڕین لە ترسان ≡ ١. بە سفیدی گراییدن ٢. رنگ باختن از ترس

**سپی کردن**: ١. پەڕ یان موو ڕنینەوە لە پێست ٢. توێکڵ لێ‌کردنەوە ٣. *[کینایە]* کوشتن؛ مراندن ≡ ١. پر یا موی کندن از پوست ٢. پوسته کندن ٣. کُشتن

**سپی کردنەوە**: ١. دەفری مس بە قەلایی سواغ دان ٢. *[کینایە]* کوشتن؛ مراندن ≡ ١. سفید کردن ظروف مسین ٢. کُشتن

**سپی هەڵگەڕان**: ڕەنگ پێ‌نەمان ≡ رنگ باختن

**سپیات** / sipyat/: ناو. لیچاڵ ≡ لبنیات

**سپیاتفرۆش** / sipyatf(i)roş/: ناو. ماسی؛ ماس‌فرۆش ≡ لبنیات‌فروش

**سپیاتی** / sipyatî/: ناو. سپیاهی؛ سپیایی: ١. سپییەتی؛ چەرمگی؛ چەرموویی ٢. شیرەمەنی؛ شیر و خۆراکی لێ بەرهەمهاتوو (وەک: ماست، پەنیر، کەرە و...) ≡ ١. سفیدی ٢. لبنیات

**سپیاڤ** / sipyav/: ☜ سپیاو

⊡ **سپیاڤ کرن**: ☜ سپیاو کردن

**سپیان** / sipyan/: ناو. *[مەجاز]* گۆشتی مەڕ ≡ گوشت گوسفند

**سپیاو** / sipyaw/: ناو. سپیاڤ؛ دەرمانی دەموچاو سپی کردن بۆ جوانی ≡ سفیداب آرایش

⊡ **سپیاو کردن**: سپیاڤ کرن؛ خۆ جوان کردن بە سپیاو ≡ آرایش کردن با سپیداب

**سپیاوۆکە** / sipyawoke/: ناو. شۆرباوی هێلکە ≡ نوعی اشکنه

**سپیاهی** / sipyahî/: ☜ سپیاتی

**سپیایی** / sipyayî/: ☜ سپیاتی

**سپی‌بالا** / s(i)pîbala/: ناو. سپیدبالا؛ کازیوە؛ بوولێڵە؛ کازیوەی بەیان ≡ فجر کاذب

**سپی‌بۆرە**[١] / s(i)pîbore/: ناو. سپی‌پات: ١. ڕەنگی سپی خاڵ‌ڕەش ٢. ئەسپی سپی خاڵ‌ڕەش ≡ ١. رنگ ابلق ٢. اسب ابلق

**سپی‌بۆرە**[٢]: ئاوەڵناو. سپی‌پات؛ بە ڕەنگی سپی بۆرە ≡ ابلق

**سپی‌بۆز**[١] / s(i)pîboz/: ناو. ١. ڕەنگی ئەسپی سپی ئاماڵ‌بۆر ٢. ئەسپی سپی ئاماڵ بۆر ≡ ١. رنگ سفید مایل بە خاکستری ٢. اسب سفید مایل بە خاکستری

**سپی‌بۆز**[٢]: ئاوەڵناو. بە ڕەنگی سپی ئاماڵ بۆر ≡ سفید مایل به خاکستری

**سپی‌بەڵەک** / s(i)pîbełek/: ناو. کانوونی سەرسپی؛ جۆرێک مراوی ≡ مرگوس سفید

**سپی‌پات** / s(i)pîpat/: ☜ سپی‌بۆرە

**سپی‌پێست**[١] / s(i)pîpêst/: ناو. خەڵکی سپی پێست، یەکێ لە چوار گرۆی گەورەی خەڵکی دنیا ≡ سفیدپوست

**سپی‌پێست**[٢]: ئاوەڵناو. سەر بە خەڵکی سپی پێست ≡ سفیدپوست

**سپیتاڵە** / s(i)pitałe/: ئاوەڵناو. سپی‌ئەسمەر؛ سپی ئاماڵ گەنم ڕەنگ ≡ سفید کمی گندمگون

**سپیتەڵۆک** / s(i)pîtełok/: ئاوەڵناو. بە پـاوە وشـک بوو (دار) 🇮🇷 خشکیده (درخت)

**سپیچک** / s(i)pîçik/: نـاو. ١. سـپێنەی چـاو ٢. سپێنەی هێلکە 🇮🇷 ١. سفیدی چشم ٢. سفیدەی تخم‌مرغ

**سپیچۆلک**[١] / s(i)pîçolik/: نـاو. ئاخ‌ڕەنـگ؛ ڕەنگـی خاک 🇮🇷 رنگ خاکی

**سپیچۆلک**[٢]: ئاوەڵناو. بە ڕەنگی خاک 🇮🇷 خاکی رنگ

**سپیچەرۆک** / s(i)pîçerok/: ئاوەڵـناو. سپی چەلۆک؛ بە ڕەنگ و ڕوخساری زەرد 🇮🇷 زرد چهره

**سپیچەلۆک** / s(i)pîçelok/: ☜ **سپیچەرۆك**

**سپیدار** / s(i)pîdar/: نـاو. ئەسـپیدار؛ ئەسـپندار؛ سـپیندار؛ ئەسـپیندار؛ سـپێدار؛ سـپییەچنار؛ کوولەکەچنار؛ هەوران؛ هەڤران؛ شاتان؛ ئەسـپین؛ خۆجەلی؛ خوور؛ دارێکـە لـە تـیرەی دارەبی، بـە تاجێکی باز و هێلکەیی، گەڵای سـپی لۆکەئاسـا، چرۆی سپی و تاڵ‌ـتاڵ و جەوی نووسـنەکەوە 🇮🇷 سپیدار

**سپیدبالا** / s(i)pîdbala/: ☜ **سپی‌بالا**

**سپیدپەهنا** / s(i)pîdpehna/: نـاو. بـەیانی ڕوون؛ هەوەڵ بەیان 🇮🇷 فجر صادق

**سپیدە** / s(i)pîde/: نـاو. سـپێدە؛ سـفیدە؛ زەردە؛ بەرەبـەیان؛ ڕوونـاکی کـەمی لای ڕۆژهـەڵاتی ئاسمان پێش لە خۆر کەوتن 🇮🇷 پگاه

▣ **سپیدە دان:** بەیان ئەنگووتن؛ دیاری دانی سپیدە بە نیشانەی سەرەتای ڕۆژ 🇮🇷 سپیده سر زدن

**سپیدەمان** / s(i)pîdeman/: نـاو. ١. بەرەبـەیان ٢. زێڕی کەم‌عەیار 🇮🇷 ١. پگاه ٢. طلای کم‌عیار

**سپیڕۆژ**[١] / s(i)pîřoj/: ناو. ڕۆژی سپی؛ ئەو ڕۆژانەی کەشە هـەوری سـپی بـەری ڕۆژ دەگـرێ 🇮🇷 روزِ ابریِ روشن

**سپیڕۆژ**[٢]: ئاوەڵـناو. /کینایە/ بەختـەوەر؛ بـەختیار؛ خۆشبەخت؛ کامەران 🇮🇷 خوشبخت

**سپیڕەگ** / s(i)pîřeg/: ناو. ڕەگی لەنفی کە تـراوی لەنفی تێدا دەگەڕێت 🇮🇷 رگ لنفی

**سپیک** / s(i)pîk/: نـاو. سپێنەی هێلکە 🇮🇷 سـفیدەی تخم‌مرغ

**سپیکار** / s(i)pîkar/: ئاوەڵـناو. چەرمـەڵ؛ گـەچکار؛ چەرمەڵانە؛ چەرمەڵە 🇮🇷 سپیدوَش

**سپیکاری** / s(i)pikarî/: نـاو. کـاری سـواخ دان و سپی کردنەوەی دار و دیوار بە ماکی سپی (وەک گەچ، ڕەنگ و ...) 🇮🇷 سفیدکاری

**سپیکە** / s(i)pîke/: ناو. جۆرێ ترێ 🇮🇷 نوعی انگور

**سـپیکەلە** / s(i)pîkele/: ئاوەڵـناو. ١. سـپیلە؛ سپی‌واش؛ ئامـاڵ‌سـپی ٢. /کینایە/ ڕوون و جـوان ‹وڵاتە سپیکەلە خۆشەویستەکەم! «شـێرکۆ»› 🇮🇷 ١. مایل به سفید ٢. روشن و زیبا

**سپیلک**[١] / s(i)pîlik/: ناو. ١. ڕشک؛ گەرای ئەسـپێ ٢. گۆشتی سنگی مەل ٣. پووز؛ گۆشتی بەلـەک ٤. سـپێنە؛ چەرمێنـە؛ سـپیایی نـاو هێلکـە ٥. سپێنەی چاو؛ سپیایی دەوری ڕەشـکێنەی چـاو ٦. کلۆشی گەنم کە دانەکەی زۆر کەم بێ؛ گوڵە گەنمی بێ‌دان 🇮🇷 ١. تخم شپش ٢. گوشت سـینەی پرنده ٣. نرمەی ساق ۴. سپیدەی تخم‌مرغ ۵. سپیدی چشم ۶. ساقه و خوشەی کم‌دانەی گندم

**سپیلک**[٢]: ئاوەڵـناو. سـپی؛ چـەرمگ؛ چـەرموو (ــ ئەسپ ب) خاک 🇮🇷 سفید (اسب و خاک)

**سپیلکاپێ** / s(i)pîlkapê/: نـاو. لـوولاک؛ پێشـەی ساق 🇮🇷 استخوان ساق

**سپیلکە**[١] / s(i)pîlke/: نـاو. ١. ئـەو دەنکـە گـەنم و نۆکانەی لـە قۆزاخـە نەهاتوونـە دەرێ و لـە نێـو سوورایی جەزەکەدا دیارن ٢. جۆرێ مـازوو 🇮🇷 ١. دانەی هنوز از خوشه نیفتاده ٢. نوعی مازوج

**سپیلکە**[٢]: ئاوەڵناو. سپی‌واش 🇮🇷 سفیدفام

**سپیلە** / s(i)pîle/: ☜ **سپیکەلە ـ١**

**سپیلۆک** / s(i)pîłok/: ☜ **سپی‌واش**[٢]

**سپین** / s(i)pîn/: ناو. تیغە؛ تێغە؛ نێوان ☰ تیغە

**سپیناغ** / s(i)pînağ/: ☜ **ئەسپەناخ**

**سپیندار** / s(i)pîndar/: ☜ **سپیدار**

**سپینگ** / s(i)pîng/: ☜ **سپنگ**

**سپیواژ** / s(i)pîwaj/: ☜ **سپیواش**

**سپیواش**[1] / s(i)pîwaş/: ناو. سپیواژ؛ سبات؛ سپات ☰ رنگ کِرم

**سپیواش**[2]: ئاوەڵناو. سپیواژ؛ سپیلۆک؛ سبات؛ سپات ☰ کرم رنگ

**سپیوسۆڵ** / s(i)pî w soł/: ئاوەڵناو. سپی و ساف و لووس ‹ناسک و نەرمونۆڵن/ خاوێنن، سپیوسۆڵن «هێمن»› ☰ سفید و صاف

**سپیەتی** / sipyetî/: ناو. چەرمگی ☰ سفیدی

**سپیەکوژە** / sipyekuje/: ☜ **سپێکوژە**

**سپییەتی** / s(i)pîyetî/: ناو. سپێتی؛ سپیاتی؛ سپیاهی؛ چەرمگی؛ چەرموویی ☰ سفیدی

**سپییەچنار** / s(i)pîyeç(i)nar/: ☜ **سپیدار**

**سپییەڕۆژ** / s(i)pîyeřoj/: ناو. کەوەڕۆژ؛ ڕۆژی بێهەتاو ☰ روز ابری

**سپێ** / s(i)pê/: ناو. ئەسپێ؛ هەسپێ؛ هسپی؛ سپپی؛ سپە؛ سپی؛ هەپش؛ هەپشێ؛ هش؛ ئەسپشێ؛ سەپیە؛ شش؛ هەشپش؛ هەشپشێ؛ هەشپشی؛ گنار؛ جوونات؛ مێروویەکی چکۆلەیە لە نێو قژ و لە تۆی جلوبەرگدا گەرا دەکا و گەورەی نەخۆشی بلاو دەکاتەوە ☰ شپش

⊡ **سپێ تێدان**: سەرهەڵدانی سپێ لە سەر و لەش و جلوبەرگدا ☰ شپش زدن

**سپێ کوشتن**: *[کینایە]* پا لە پەین دان ☰ مگس پراندن

**سپێ لە گیرفانا چۆپی کێشان**: *[مەجاز]* تەواو بێپووڵ و پارە بوون ☰ جیب خالی بودن

**سپێتی** / s(i)pêtî/: ناو. سپییەتی؛ سپیاتی؛ چەرمگی؛ چەرموویی ☰ سفیدی

**سپێخۆر** / s(i)pêxor/: ئاوەڵناو. *[پلار]* هیچوپووچ؛ خوێڕی و بێکارە ☰ بیخاصیت

**سپێدار** / s(i)pêdar/: ☜ **سپیدار**

**سپێدە** / s(i)pêde/: ☜ **سپیدە**

**سپێدەزوو** / s(i)pêdezû/: ئاوەڵکار. بەیانەکی؛ بەرەبەیان؛ شەوەکی ☰ سپیدەدم

**سپێر** / s(i)pêr/: ناو. ١. چەپەر؛ خەڵ؛ سەنگەر ٢. سپەر؛ سوپەر؛ سوپێر؛ مەتاڵ؛ مەرتاڵ؛ ئامرازی شەڕکەر بۆ خۆ پاراستن لە شمشێر و تیر بە کاریان دێنا ٣. یەدەکی؛ ئامرازی زێدە بۆ کار ٤. هەر جۆرە ئامرازێ بۆ پاراستنی شتێ لە مەترسی (وەک سپێری ماشێن و ...) ☰ ١. سنگر ٢. سپر ٣. لوازم یدکی ٤. سپر

**سپێران** / s(i)pêran/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //سپێرای؛ دەسپێرێی؛ بسپێرێ// سپێردران؛ سپاردە کران؛ بە شێوەی ئەمانەت لە شوێنێ یا لە لای کەسێ داندران ☰ سُپرده شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: سپێراو/ چاوگی نەرێنی: نەسپێران

**سپێراو** / s(i)pêraw/: ئاوەڵناو. سپاردە؛ ئەمانەتی ☰ سپرده

**سپێردران** / s(i)pêrd(i)ran/: ☜ **سپێران**

**سپێردراو** / s(i)pêrd(i)raw/: ئاوەڵناو. سپوردە؛ ئەمانەتی ☰ سپرده

**سپێرم** / s(i)pêrm/: ناو. تۆم؛ خانەی نێرینە لە ناو تۆماودا ☰ اسپرم

**سپێکوژە** / s(i)pêkuje/: ناو. سپیەکوژە؛ بەرانکێ؛ بەرانەک؛ قامکە گەورە ☰ انگشت شست

**سپێنە** / s(i)pêne/: ناو. ١. سپیلکی هێلکە ٢. سپیلکی چاو ☰ ١. سفیدەی تخم‌مرغ ٢. سفیدی چشم

**سپێون** / s(i)pêwin/: ئاوەڵناو. ئەسپێون؛ ڕشکۆ؛ ڕشکن؛ ششوو ☰ شپشو

**ستا / s(i)ta/:** ناو. ئەستێ؛ کوچک چەخماخ 🇮🇷 سنگ آتشزنه

**ستاپ / s(i)tap/:** ناو. تورمز؛ ئامێری گرتنەوەی کەرستەی چەرخدار 🇮🇷 تُرمُز

**ستار / s(i)tar/:** ناو. ۱. کاری داپۆشین ‹ماڵە لادێیەک بە چەند سیپاڵێکەوە هاتۆتە شار، لە چاوە خانوویەک دەگەڕێ تێیدا ستار بێ «هەژار، چێشتی مجێور»› ۲. ئارامی؛ ئۆقرە 🇮🇷 ۱. ستر؛ قایم ۲. آرامش

◘ **ستار کردن:** ۱. تاقەت کردن؛ پۆشینی نهێنی ۲. ئارام بوون؛ ئۆقرە گرتن. هەروەها: **ستار بوون** 🇮🇷 ۱. پوشیدن و پنهان داشتن ۲. آرام گرفتن

**ستار گرتن:** ئارام بوون 🇮🇷 آرام شدن

**ستارخانی / s(i)tarxanî/:** ناو. جۆرێ کەوای پیاوانەی نیوقەد 🇮🇷 نوعی نیم‌تنەی مردانه

**ستارە / s(i)tare/:** ناو. ۱. ☜ **ئەستێرە** ۲. دیوارۆکەی دەوری سەربان 🇮🇷 ۱. ☜ **ئەستێرە** ۲. جان‌پناه

**ستاڤ / s(i)tav/:** ناو. سایەی پەنا خۆرەتاو 🇮🇷 سایەی مجاور آفتاب

**ستامپ / s(i)tamp/:** ناو. باسمە؛ ستامپ؛ دەفر و جەوهەری قامک لێ نان 🇮🇷 استامپ

**- ستان / -s(i)tan/:** پاشوشە. ئەستێن؛ وەرگر ‹دلستان› 🇮🇷 - ستان

**- ستان / -istan/:** پاشگر. ۱. جێ و شوێنی شتێ ‹دارستان› ۲. شوێنی سەقامگیر بوونی نەتەوەیەک ‹کوردستان› 🇮🇷 ۱و۲. - ستان

**ستانای / s(i)tanay/:** ☜ **سانەی**

**ستاندن / s(i)tandin/:** چاوگ. تێپەڕ. //ستاندت؛ دەستێنی؛ بستێنە// ساندن؛ سەندن؛ ئەستاندن؛ سەنن؛ سەنین؛ ستەندن؛ سانەی؛ سانای؛ ئەسەی؛ ئەسای؛ ئەستەی؛ ستانای: ۱. وەرگرتن ۲. *[مەجاز]* داگیر کردن؛ بە زۆر بردن 🇮🇷 ۱. گرفتن ۲. غصب کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەستاندن

**ستاندنەوە / s(i)tand(i)newe/:** چاوگ. سەندنەوە؛ وە دەست خستنەوە 🇮🇷 بازپس گرفتن

**ستانگ / s(i)tang/:** ناو. ستەنگ؛ ستینگ: ۱. زەردەواڵە؛ زەرگەتە؛ هەنگەژاڵە ۲. ژەنگەسوورە؛ شەنگەسوورە ۳. کەنگر؛ کەنگەر 🇮🇷 ۱. زنبور زرد ۲. زنبور قرمز ۳. کنگر

**ستایش / s(i)tayiş/:** ناو. تاریف؛ پەسن 🇮🇷 ستایش

**ستر / sitr/:** ناو. ۱. پەیژە؛ پەیجە؛ پاپەینجە؛ نەردیوان؛ ناردیوان؛ سلەم ۲. کاری پۆشینی نهێنی 🇮🇷 ۱. نردبان ۲. عمل پوشیدن راز

**ستراتیژی / sitratîjî/:** ناو. ستراتێجی؛ زانستی کەڵک وەرگرتن لە هەموو هەڵێکی رامیاری، ئابووری، چەکداری و دەروونی بۆ پێکهێنانی زۆرترین پشتیوانی لە ڕەوتی رامیاری ڕەچاوکراودا 🇮🇷 استراتژی

**ستراتێجی / s(i)tratêcî/:** ☜ **ستراتیژی**

**ستران / sitran/:** ناو. گۆرانی؛ بە شیعر و ئاهەنگێک دەڵێن کە بۆ یەکتر ساز کرابێتن و گۆرانیبێژێک بە پێودانگی مۆسیقایی بیڵێتەوە. لە شێوازەکانی سترانی کوردی: بەستە، هۆرە، سیاوچەمانە، چەمەری، حەیران، لاوک، بەیت و ... 🇮🇷 ترانە؛ تصنیف

**سترانبێژ / sitranbêj/:** ناو. سترانڤان؛ قامبێژ؛ دەنگبێژ؛ گۆرانیبێژ 🇮🇷 خواننده

**ستراندن / sitrandin/:** چاوگ. ۱. گۆرانی گوتن؛ ئاواز خوەندن ۲. شێلان (هەویر) 🇮🇷 ۱. خواندن (ترانه) ۲. سرشتن (خمیر)

**سترانڤان / sitranvan/:** ☜ **سترانبێژ**

**سترک / sitrik/:** ناو. ۱. بنکەچرێش؛ بنەچرێش ۲. پەیژەی کورت 🇮🇷 ۱. پیاز گیاه سریش ۲. نردبان کوتاه

**سترۆ** / sitro/: ناو. ستروو؛ ستر؛ سترهـ؛ سترەهـ؛ ستروو؛ ئەسترۆ؛ شاخی حەیوان ☰ شاخ حیوان

**سترۆدار** / sitrodar/: ئاوەڵناو. شاخدار؛ قۆچدار ☰ شاخدار

**سترۆنتیوم** / s(i)tront(i)yum/: ناو. سترۆنسیوم؛ توخمی کیمیاوی کانزایی سووک، نەرم و چەکوشخۆر، بە ژمارەی ئەتومی ۳۸ و کێشی ئەتومی ۸۷,٦۲ کە تەنیا بە شێوەی لێکدراو هەیە ☰ استرونتیُم

**سترۆنسیوم** / s(i)trons(i)yum/: ☜ **سترۆنتیوم**

**سترو** / sitrû/: ☜ **سترۆ**

**سترە** / sitre/: ناو. کۆت؛ جۆرێ باڵاپۆشی کورتە لە سەر کراس و جلیقەوە دەیپۆشن ☰ کُت

**سترهاندن** / s(i)tirhandin/: ☜ **سترین**

**ستری** / sitrî/: ناو. ۱. درک؛ چقڵ؛ دروو ۲. تووترک؛ تووددڕک ☰ ۱. خار ۲. تمشک

**ستریبرک** / sitrîbiřk/: ناو. داری دووحاچەی درووکۆ کردنەوە ☰ چوب دوشاخەی خارکنی

**ستریزەرک** / sitrîzerk/: ناو. زەردەسیری؛ درووە زەردە ☰ زردخار

**ستریشینک** / sitrîşînk/: ناو. ستریشینکە؛ وشترخۆرە ☰ خارشتر

**ستریشینکە** / sitrîşînke/: ☜ **ستریشینک**

**ستریمشک** / sitrîmişk/: ناو. بنە دڕکێکە ☰ خاربُنی است

**سترین** / sitrîn/: چاوگ. سترهاندن؛ شێلان ☰ سرشتن

**سترینگەه** / s(i)trîngeh/: ناو. بەندەر؛ شاری سەر دەریا ☰ شهر بندری

**ستریۆ** / s(i)tiryo/: ناو. تۆمارگە؛ شوێنی تۆمار کردن ☰ استریو

**ستر** / s(i)tiř/: ☜ **سترۆ**

**سترە** / sitřih/: ☜ **سترۆ**

**سترەه** / sitřeh/: ☜ **سترۆ**

**ستک** / sitik/: ناو. سێوەڵووکە؛ گیایەکە بەرێکی خڕی بەتام دەگرێ ☰ گیاهی با میوەی گرد خوراکی

**ستڵ** / sitł/: ☜ **سەتڵ**

**ستماندن** / sitmandin/: چاوگ. ۱. هەڵوەشاندن ۲. وێران کردن ۳. بێدادی کردن؛ ستەم کردن ☰ ۱. برهم زدن ۲. خراب کردن ۳. ستم کردن

**ستورک** / s(i)turik/: ☜ **ستهورك**

**ستون** / s(i)tun/: ☜ **ستوون**

**ستوین** / s(i)tuyn/: ☜ **ستوون**

**ستۆ** / s(i)to/: ناو. ئەستۆ؛ مل ☰ گردن

▣ **وە ستو گرتن:** لە ئەستۆ گرتن؛ ئۆدەدار بوون؛ بەڵێن دان بۆ جێبەجێ کردنی کارێک ‹... ئەی چۆنە ڕۆژانە دوکانەکەم بۆ خاوێن کەیەوە و کاروباری بازاڕ چوون و شت بۆ ماڵ کڕین وە ستۆ گری؟ مانگی چوار دینارت دەدەمێ «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ به عُهده گرفتن

**ئۆباڵ/ ومباڵ وە ستو بون:** تاوان لە مل بوون ☰ مسئول بودن

**ستۆبازن** / s(i)tobazin/: ناو. گیانداریکی خزۆکە ☰ خزندەای است

**ستۆپارێز** / s(i)toparêz/: ناو. شاڵ؛ ملپێچ ☰ شال‌گردن

**ستۆخوار** / s(i)tox(i)war/: ئاوەڵناو. زۆر بەرفەرمان؛ ملکەچ لە بەر دەستی مەزنی خۆیدا ☰ فرمانبردار

**ستۆکرک** / s(i)tokirk/: ناو. ستۆکوڕک؛ ستۆکورک؛ ستۆکڕک؛ ستۆکوڕ: ۱. ترتڕک؛ ترترۆک؛ سوورێنچکە؛ لوولەیەکی سووری لە ناوەوە گەوگەوە، هەناسەی پێدا دێ ۲. خرخراکە؛ هەفیک؛ قورقوراگە؛ قورقورانچک ☰ ۱. نای ۲. خِرخِره

**ستۆکرک** / s(i)tokiřk/: ☜ **ستۆکرك**

**ستۆكورك / s(i)tokurk/:** ☜ **ستۆكرك**

**ستۆكوڕ / s(i)tokuř/:** ☜ **ستۆكرك**

**ستۆكوڕك / s(i)tokuřk/:** ☜ **ستۆكرك**

**ستو / s(i)tû/:** ناو. ستووڤ؛ ستووڤـە: ١. شـایەتی ٢. مل؛ گەردن؛ ئەستۆ ☲ ١. گواهی ٢. گردن

▣ **ستو دان:** ستووڤ دان؛ ستووڤـە دان؛ شـایەتی دان ☲ گواهی دادن

**ستور / s(i)tûr/:** ئاوەڵناو. ئەستوور؛ قەوی ☲ ستبر

**ستوربو / s(i)tûrbû/:** ئاوەڵناو. ماسـیو؛ هەلامسـاو؛ پەنەماو ☲ آماسیده

**ستورك / s(i)tûrik/:** ناو. کـولێرە؛ سـتورک؛ نـانی گرد و ئەستوور ☲ گرده نان

**ستوری / s(i)tûrî/:** نـاو. ئەسـتووری؛ گـزارە؛ کوڵوفتی ☲ کلفتی؛ ستبری

**ستوریە / s(i)tûr(i)ye/:** ناو. ئەستووری ☲ کُلُفتی

**ستوڤ / s(i)tûv/:** ☜ **ستو**

▣ **ستوڤ دان:** ☜ **ستو دان**

**ستوڤە / s(i)tûve/:** ☜ **ستو**

▣ **ستوڤە دان:** ☜ **ستو دان**

**ستون / s(i)tûn/:** نـاو. ستوونە؛ ستینک؛ ئەسـتون؛ ئەسـتوون؛ سـتون؛ سـوون؛ سـتوین؛ هەسـتون؛ هەسـوون؛ ئەسـتوونە؛ ئەسـتوندەک؛ ئەسـتۆنگ؛ ئەستوند: ١. کۆڵەکە؛ کۆڵـەکێ؛ لـەی؛ دیلـەک؛ دیـرەک؛ دیـرەگ؛ تـیرەگ؛ گـاوە؛ چەڵـەکە؛ دەسەک؛ نێوە؛ سێوە؛ پاژەر؛ پێکهاتەیەکی وەستاو لە کانزا، چێو یان بەرد بۆ ڕاگرتنی میچ کە دێتـە سەری ‹ستوونـی ناوەڕاستی دیوەکە قەڵشـابوو› ٢. کۆڵەکە؛ هەر شتێکی وەکوو ئەسـتوون ٣. *[چاپ]* ڕیزێک نووسراوە لە ژێر یەکتر و لە پاڵ ڕیـز یـان ڕیزگەلی تردا ‹ستوونـی ڕۆژنامـە› ٤. *[چەکداری]* ڕیز؛ گرۆیەک لە چەکداران و ماشینی چەکـداری کە بـە ڕیـز دەکەونـە شـوێن یـەک ‹خەبـەرمان وەرگرت کە چەند ستوونێکی دەوڵەتی و جاشـی زۆر لە چەنـد جێـوە هجـووم دەکـەن «هـەژار، چێشـتی مجێور»› ٥. *[مەجاز]* کۆڵەکە؛ پشـتیوان؛ پاڵپشـت ‹ستوونـی بنەماڵە بوون› ☲ ١تا٥. ستون

▣ **ستونا پشت:** مۆغەرەی پشت؛ مۆرکی پشت ☲ ستون فقرات

**ستونی پێنجەم:** شۆفاران و ئەوانەی بۆ دژمن کار دەکەن ☲ ستون پنجم

**ستونە / s(i)tûne/:** ☜ **ستون**

**ستونی / s(i)tûnî/:** ئاوەڵـناو. ئەسـتوندەکی؛ قیـت؛ ڕاست وەک کۆڵەکە ☲ عمودی

**ستە / s(i)te/:** نـاو. ستەو؛ ستی؛ ستێ: ١. ئەستێ؛ بەردی ئاگرپژێن ٢. ئاسـنێ کـە لـە بەردئەسـتێ دەدرێ ☲ ١. سنگ آتشزنه ٢. آهنی کـه بـر سـنگ آتشزنه زنند

**ستەرك / s(i)terk/:** ناو. مێز؛ کورسی بـۆ لـە سـەر نووسین ☲ میز تحریر

**ستەكان / s(i)tekan/:** ☜ **ئیستیكان**

**ستەم**[1] **/ s(i)tem/:** ناو. زوڵم؛ ناهەقی؛ گووج ☲ ستم

**ستەم**[2]: ئاوەڵـناو. حەسـتەم؛ دژوار ‹زۆر سـتەمە بیدۆزمەوە› ☲ دشوار

**ستەمكار / s(i)temkar/:** ئاوەڵناو. سـتەمگەر؛ زاڵـم؛ چەوسێنەر ☲ ستمگر

**ستەمكاری / s(i)temkarî/:** نـاو. خـوێنمژی؛ گووجکاری ☲ خونخواری

**ستەمگەر / s(i)temger/:** ☜ **ستەمكار**

**ستەندن / s(i)tendin/:** ☜ **ستاندن**

**ستەنگ / s(i)teng/:** ☜ **ستانگ**

**ستەو / s(i)tew/:** ☜ **ستە**

**ستەور / s(i)tewir/:** ئاوەڵناو. ستێور؛ ئەستێور؛ قسر ☲ سِتروَن

**ستەول / s(i)tewil/:** ناو. پشتێر؛ گـەوەڕ؛ گـەوڕ ☲ اصطبل

**ستەیر / s(i)teyr/:** ناو. ئەستێرە؛ هەسارە ☲ ستاره

**ستی / s(i)tî/:** ☜ **سته**

**ستیرمه / s(i)tîrme/:** ناو. گیرۆیی؛ تەشەنا؛ سەرایەت؛ ڕەوتی ڕاگواستنی دۆخێک (وەک: نەخۆشین، پێکەنین و ...) لە یەکێ بۆ یەکێکی تر ■ سرایت

**ستیڤلۆک / s(i)tîvlok/:** ناو. جرجەکوێرە ■ موش کور

**ستین / s(i)tîn/:** ناو. تین؛ تاو؛ هێز؛ توانایی ■ توان

**ستینک / s(i)tînik/:** ☜ **ستون**

**ستینگ / s(i)tîng/:** ☜ **ستانگ**

**ستێ / s(i)tê/:** ناو. ١. ☜ **سته** ٢. دش؛ دوش؛ خوشکی مێرد ■ ١. ☜ سته ٢. خواهر شوهر

**ستێر / s(i)têr/:** ناو. ١. ☜ **ئەستێره** ٢. ئەستێرک؛ هەسێل؛ گۆلاوێ دەسکرد ■ ١. ☜ **ئەستێره** ٢. استخر

⊡ **ستێر پژیان:** ڕاخوشینی تیرئەستێرە ■ آذرخش زدن شهاب

**ستێرک / s(i)têr(i)k/:** ناو. ئەستێرە؛ هەسارە ‹وەک ستێرکا لە عەزمانان› ■ ستاره

**ستێرۆک / sitêrok/:** ناو. ئەستێرۆکە؛ گوەستێرە؛ گوڵئەستێرە ■ کرم شبتاب

**ستێره / s(i)têre/:** ☜ **ئەستێره**

**ستێڕ / s(i)têř/:** ناو. ستێرک؛ ستێرە؛ پێرک؛ هەرزاڵ؛ جێگەی کەلوپەل لە سەر دانان لە ڕەشماڵدا ■ جای سکومانند در سیاه چادر

**ستێڕک / s(i)têřik/:** ☜ **ستێڕ**

**ستێڕه / s(i)têře/:** ☜ **ستێڕ**

▪ **ستێن / -s(i)tên/:** پاشوشە. ـ ئەستێن؛ ـ سێن؛ ـ ستان؛ ـ گر ‹باجستێن› ■ ـ ستان

**ستێور / s(i)têwir/:** ☜ **ستەور**

**سج / sic/:** ☜ **زج**

**سجوق / s(i)cuq/:** ☜ **سجووق**

**سجۆق / s(i)coq/:** ☜ **سجووق**

**سجووق / s(i)cûq/:** ناو. سنجۆق؛ سجۆق؛ سجوق؛ باسوخ؛ باسوق؛ باستیک؛ خواردنێکی شیرینە لە نیشاستە و شیرە و شەکەر دەکرێ ■ باسلُق

**سجه[1] / s(i)ce/:** ناو. سوجە؛ سوججە؛ ڕەنگی سووری کاڵ ■ قرمز روشن

**سجه[2]:** ئاوەڵناو. سوجە؛ سوججە؛ بە ڕەنگی سووری کاڵ ■ به رنگ قرمز روشن

**سجیل / s(i)cîl/:** ناو. ناسنامە؛ هەویە ■ شناسنامه

**سچ / siç/:** ناو. سڕ؛ مچ؛ گەنە؛ پێتک ■ نوعی کنەی کوچک

**سچاندن / s(i)çandin/:** ☜ **سوتاندن**

**سچانن / s(i)çanin/:** ☜ **سوتاندن**

**سچق / s(i)çiq/:** ناو. باسترمە؛ پاستورمە ■ کالباس

**سچیان / siçyan/:** ☜ **سوتان**

**سحا / s(i)ĥa/:** ئاوەڵکار. سوحا: ١. بەیان؛ لە بەرەبەیاندا ٢. سبحەی؛ سبحەینێ؛ ڕۆژی دوایی ■ ١. بامداد ٢. فردا

**سحاله / s(i)ĥale/:** ناو. ئاردەبرنج ■ آرد برنج

**سخ[1] / six/:** ئاوەڵناو. سغ: ١. تەنراوی زۆر بە پۆی سفت ٢. چڕ و پڕ ‹مێشەکە سخ بووە› ■ ١. سِفت تنیده ٢. انبوه و پُرپُشت

**سخ[2]:** دەنگ. سغ؛ وشەیەکە لە کایەدا، بەرانبەر بە «تخ» دەیڵێن، واتا بە قسەی تۆ نەبێ و ژێر نەکەوم ■ اصطلاحی در بازی، مانند: «پُر» در مقابل «پوچ»

**سخاته / s(i)xate/:** ناو. شەمچە؛ کرمیت؛ شقارتە ■ کبریت

**سخار / s(i)xar/:** ئاوەڵناو. سخرە؛ نەکێڵ؛ تایبەتمەندی زەوینێ کە بۆ کێڵان نابێ ■ غیرقابل کشت

**سخان / s(i)xan/:** ☜ **ئێسك**

**سختیان / sixt(i)yan/:** ناو. سەخەری؛ چەرمی ئەستووری لە دەباغ دراو ■ چرم ساغری

**سخر** / sixr/: ناو. زنج؛ کۆختەی لە قامیش ☰ کوخ از نی

**سخرک** / sixrik/: ناو. زنجی بچکۆلە ☰ کلبەی کوچک از نی

**سخره** / sixre/: ☜ سخار

**سخلمه** / sixiłme/: ☜ سخورمه

**سخلەت** / sixłet/: ☜ سەخلەت

**سخمه** / sixme/: ☜ سوخمە-١

**سخورمه** / s(i)xurme/: ناو. سوخورمه؛ سوخرمه؛ سەخورمه؛ سیخورمه؛ سیمرخ؛ سلخمه؛ سقلمه؛ گۆمرچه؛ گولم؛ گورمشت؛ کاری بە مشت لێدان ☰ سُقُلمه

**سخیف** / s(i)xîf/: ☜ سخێف

**سخێف** / s(i)xêf/: ناو. سخیف؛ سقێف؛ جوێن؛ دژنێو؛ دژوون؛ دژمان؛ جنێو ☰ دُشنام

⊡ **سخێف گوتن**: جنێو دان؛ دژوێن دان ☰ دشنام دادن

**سخێفبێژ** / s(i)xêfbêj/: ئاوەڵناو. جنێوفرۆش؛ دوژێنفرۆش؛ جوێنفرۆش ☰ بدزبان

**سداب** / s(i)dab/: ناو. ئەسپەندەر؛ قانگ؛ دیدی؛ گیای ئسپەند ☰ سپند

**سداره** / s(i)dare/: ناو. جۆرێ کڵاو ☰ نوعی کلاه

**سدان** / s(i)dan/: ناو. ١. دەزگای پینەچی و ئاسنگەر ٢. خەرات؛ کەسێ قاپ و ئامانی داری دروست دەکا ☰ ١. ابزار آهنگر و پینەدوز ٢. خرّاط

**سده** / s(i)de/: ناو. سدێ؛ ڕایەڵ؛ ئەو ڕیزە بەنەی پۆی تێوە دەدرێ ☰ تارِ بافتنی

**سدێ** / s(i)dê/: ☜ سده

⊡ **سدێ کرن**: ڕایەڵ کردن ☰ تارهای بافته را مُرتب کردن

**سر**[١] / sir/: ☜ سروه

**سر**[٢]: ☜ سرك

**سرامیک** / s(i)ramîk/: ☜ سەرامیك

**سراوناى** / s(i)rawnay/: چاوگ. ١. سرەواندن؛ هێور کردنەوە ٢. *[کنایه]* ناشتن؛ بە خاک سپاردن ٣. پۆڕاندن؛ گونجاندن ‹تەوەنەکێ سراونە› ☰ ١. آرام کردن ٢. دفن کردن ٣. در جای خود قرار دادن

**سراویاى** / s(i)rawyay/: چاوگ. ١. سرەوان؛ هێور بوونەوە ٢. *[کنایه]* نێژران؛ لە خاک نران ٣. پۆڕان؛ گونجان ☰ ١. آرام گرفتن ٢. دفن شدن ٣. در جای خود قرار گرفتن

**سرپ** / sirp/: ناو. سورب؛ سرفت؛ سەرمی؛ مزا؛ مز؛ قورقوشم؛ توخمی کیمیاوی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ٨٢ و کێشی ئەتومی ٢٠٧,٢٠، کە نەرم و چەکوچخۆر و بۆرە ☰ سُرب

**سرپاته** / sirpate/: ☜ تلّفار

**سرپاندن** / sirpandin/: چاوگ. سرکاندن؛ سرتاندن؛ سرتە کردن؛ سرپیای؛ چپە کردن ☰ پچ - پچ کردن

**سرپناى** / sirp(i)nay/: چاوگ. سرپاندن ☰ پچ - پچ کردن

**سرپه** / sirpe/: ناو. پچە؛ چپە ☰ نجوا؛ درگوشی

**سرپەسرپ** / sirpesirp/: ناو. چپەچپ؛ پچەپچ ☰ پچ - پچ؛ درگوشی

**سرپی** / sirpî/: ئاوەڵناو. سوربی؛ سرفتی: ١. دروستکراو لە سرپ ٢. بۆر؛ بە ڕەنگی خۆڵەمێشی بریقەدار ☰ ١و٢. سُربی

**سرپیاى** / sirp(i)yay/: ☜ سرپاندن

**سرت**[١] / sirt/: ناو. ١. درک؛ درووێ؛ چقڵ ٢. ئەرک و ئازار ٣. نەداری و دەستەنگی ٤. بەڵا و بەسەرهاتی ناخۆش ٥. چپەچپ ٦. هەڵەمووت؛ هەزار بە هەزار؛ چیای ڕژد و سەخت ☰ ١. خار ٢. درد و رنج ٣. بینوایی ۴. مصائب ۵. پچ - پچ؛ درگوشی ۶. کوه مرتفع و دشوارگُذر

**سرت**[٢]: ئاوەڵناو. ١. ڕەق؛ سەخت ٢. زبر؛ زرو ٣. بەرزەفڕ؛ چاولەبەرزی ٤. سرک؛ شەمووز؛

ڕەوەک؛ تۆسن ☰ ۱. سخت ۲. خشن ۳. بلندپرواز ۴. چموش؛ رموک

**سرتاندن / sirtandin/:** ☜ **سرپاندن**

**سرتغ / sirtğ/:** ئاوەڵناو. لاسار؛ سەرسەخت ☰ لجوج

**سرتوخورت / sirt û xurt/:** ناو. پچەپچ ☰ پچ ـ پچ

**سرتوهوڕ / sirt û huř/:** ناو. خرتیوپرتی؛ قسەی بەسرتە و پەنامەکی ☰ گفتگوی درگوشی و محرمانه

**سرتە / sirte/:** ناو. چپە؛ پچ؛ پچە ☰ پچ ـ پچ

⊡ **سرتە کردن:** سرپاندن؛ سرتاندن ‹ئەگەر یەکێک لە بازارەکەدا سرتەی بکردایە، من گوێم لێ دەبوو «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ پچ ـ پچ کردن

**سرتەسرت / sirtesirt/:** ناو. چپەچپ ☰ پچ ـ پچ

**سرتی / sirtî/:** ناو. ۱. بوێری؛ ئازایەتی ۲. سرکی؛ تۆسنی؛ شەمووزی ۳. دڵڕەقی؛ بێڕەحمی ٤. توند و تیژی ٥. لەمپەر و بەرگر ☰ ۱. شُجاعت ۲. چموشی ۳. سنگدلی ۴. خشونت ۵. مانع

**سرسوم / sirsûm/:** ناو. نێرەی گڵین؛ کووپەی زلی سەرقابدار بۆ ژاندنی ماست ☰ نوعی خُم سرپوشدار

**سرشت / s(i)rişt/:** ☜ **سروشت**

**سرشتی / s(i)riştî/:** ☜ **سروشتی**

**سرشک / s(i)rişk/:** ناو. ئەسر؛ ئەسرین؛ فرمێسک؛ ڕۆندک؛ ئەشک ‹تۆفانی سرشکم چووە سەر جوودی وجوودم/ کەشتی تەنی قوم کرد و نە نووح و نە ئەسەر ما «حەریق»› ☰ اشک

**سرف / sirf/:** ئاوەڵکار. تەنها؛ تەنیا؛ بەس؛ بێ شتێکی تر ☰ صرف؛ محض

**سرفت / sirift/:** ☜ **سرپ**

**سرفتن / s(i)riftin/:** ☜ **سرەوتن**

**سرفتی / siriftî/:** ☜ **سرپی**

**سرق / sirq/:** ☜ **سڵق**

**سرک / sirk/:** ئاوەڵناو. سر؛ سرگ؛ سرت؛ قوشقی؛ ڕەوەک ‹نازەنینی شۆخ و شەنگی چاوبەڵەک/ ئاسکی دڵناسکی سرک و ڕەوەک «هێمن»› ☰ رموک

**سرکاسن / sirkasin/:** ناو. دەرمانی چەرم ڕەنگ کردن ☰ داروی رنگ کردن چرم

**سرکاندن / sirkandin/:** چاوگ. تێپەڕ. //سرکاندت؛ دەسرکێنی؛ بسرکێنە// سرکانن؛ چپە کردن ☰ پچ ـ پچ کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەسرکاندن

**سرکانن / sirkanin/:** ☜ **سرکاندن**

**سرکاوی / sirkawî/:** ئاوەڵناو. بە سرکەوە تلاو ☰ سرکەای

**سرکوهۆڕ / sirk û hoř/:** ناو. سرتەسرتی زۆر ☰ پچ ـ پچ بسیار

**سرکە / sirke/:** ناو. ۱. سرتە؛ چپە؛ پچ؛ پچە ۲. سهک؛ سیهک؛ سێک؛ تەوشێکی ترش کە لە کردوکۆی باکتری ترشێنەر لە ئەلکولی تراودا بەرهەم دێ، زۆربەی ئەسید ئەسێتیک و ئاوە و ترشی پێ دروست دەکەن ☰ ۱. پچ ـ پچ ۲. سرکە

⊡ **سرکە خەفاندن:** ☜ **سرکە نانەوە**

**سرکە نانەوە:** سرکە خەفاندن؛ دروست کردنی سرکە لە ماکی شیرین (وەک میوە) ☰ سرکە انداختن

**سرکەسرک / sirkesirk/:** ناو. سرتەسرت؛ پچەپچ ☰ پچ ـ پچ

**سرکە و دۆشاو / sirke w doşaw/:** ناو. تێکەڵاوی سرکە و دۆشاوی ترێ کە شەربەتێکی وەک سکەنجەبینە ☰ سرکە شیره

**سرکەیی[1] / sirkeyî/:** ناو. ۱. هەوری؛ جۆرێ پارچەی ئاوریشمی تەنکە، ژنان بە سەریدا دەدەن ‹بێجگە لە مانە سەرباری گشتی/ مشکی و سرکەیی و جامانە و ڕەشتی «موفتی پێنجوێنی»› ۲. ڕەنگی بنەوشی کاڵ ☰ ۱. پارچەی کلاغی ۲. رنگ

سرکەای

**سرکەیی**[٢]: ئاوەڵناو. ١. بە ڕەنگی بنەوشی کاڵ ٢. سرکاوی؛ سرکە پێوە تلاو ☰ ١و٢. سرکەای

**سرکی** / sirkî/: ناو. سرتی؛ سرکی؛ تۆسنی؛ شەمووزی ☰ چموشی

**سرگ** / sirg/: ☜ **سرك**

**سرگون** / sirgûn/: ناو. ڕەوتی تاران؛ دوور خرانەوە ☰ تبعید

**سرمە** / sirme/: ناو. ملوانکە لە زێڕ یان مرواری ☰ گردنبند طلا یا مروارید

**سرمیچ** / sirmîç/: ناو. میچ؛ سەقف ☰ سقف

**سرنج** / sirinc/: ☜ **سەرنج**

**سرنجک** / s(i)rincik/: ناو. شەوە؛ مۆتە؛ مۆتەکە؛ خەوی خۆفناک کە ببێتە هۆی ترس، هەست بە خنکان و لە خەو ڕاپەڕین ☰ کابوس

**سرنجگ** / s(i)rincig/: ☜ **سرینچك**

**سرنجە** / s(i)rince/: ناو. زیخ و ڕەڵمی لێکدراو ☰ مخلوط شن و ماسە

**سرنجی** / s(i)rincî/: ☜ **سرینچك**

**سرنچک** / s(i)rinçik/: ☜ **سرینچك**

**سرنگ** / s(i)ring/: ناو. شرینقە؛ سورەنگ؛ سرینگ؛ ئاودووزەک؛ دەرزی دەرمان دە لەش کردن ☰ سُرنگ

**سرنگا** / s(i)ringa/: ☜ **سەرنگا**

**سرنیچک** / sirnîçik/: ☜ **سرینچك**

**سروان** / sirwan/: چاوگ. ئۆقرە گرتن ☰ آرام شدن

**سرواندن** / sirwandin/: ☜ **سرەواندن**

**سروانن** / sirwanin/: ☜ **سرەواندن**

**سروشت** / s(i)ruşt/: ناو. سرشت؛ سوروشت؛ تەبیات: ١. ئەو بەشە لە جیهان کە دروستکراوی دەستی مرۆ نییە (وەک: کێو، دەشت، چۆم، لێرەوار و...) ‹ڕۆژێکمان لە داوێنی سروشتدا ڕابوارد› ٢. هێزی بەدیهێنەر و هەڵوەژێری جیهان ‹قانوونی سروشت› ٣. گەد و خۆ و خدە ‹سروشتی سازگار› ٤. تایبەتمەندی پێکهاتەی شتێک ‹سروشتی ئاگر، سووتاندنە› ☰ ١تا٤. طبیعت

**سروشتی** / s(i)ruştî/: ئاوەڵناو. سرشتی؛ سوروشتی؛ خۆکرد؛ خواکرد؛ خۆوەر؛ خۆڕست؛ خۆڕسک؛ خۆڕسکاو: ١. پێوەندیدار بە تەبیاتەوە ‹زانستی سروشتی› ٢. دروسکراوی سروشت ‹دیاردەی سروشتی› ٣. پێوەندیدار بە خۆ و خدە یان غەریزەوە ‹ئاکاری سروشتی؛ دەنگی سروشتی› ☰ ١تا٣. طبیعی

**سروە** / sirwe/: ناو. سر؛ سۆسە؛ سووسە؛ شنە؛ شنەبا؛ شنۆ؛ شێنە؛ هۆنە؛ واشەنە؛ واشنە؛ وامیە؛ نەمرەیی؛ نەرمەبا؛ بای بسکان؛ بای زۆر هێدی ‹تۆ وەکوو سروەی بەیانانی بەهاری/ تۆ لە لەشما گیانی سووکی نادیاری! «سوارە»› ☰ نسیم

**سرویت** / sirwît/: ☜ **سرووت**

**سرویس** / sirwîs/: ناو. ١. ڕاژە؛ پەرایی؛ خزمەت؛ کار یان کارگەلێ زۆرتر بۆ ئاسایشی دیتران ‹دەوڵەت دەبێ سرویس بداتە خەڵک› ٢. کار و ڕەوتی شۆردن و ڕۆنکاری دەزگای میکانیکی ‹دوێنێ ماشینەکەم دا سرویسیان کرد› ٣. کۆمەڵە کەرەستەگەلی هاوگەر بە چالاکییەک، بەتایبەت کاری ناو ماڵ ‹سرویسی دەسشۆری› ٤. کەرەستەی چەشنێ خزمەت ‹سرویسی گواستنەوە› ٥. سەعاتی کار؛ ماوەی چالاکی ڕۆژانە لە مەزرینگەدا ‹سرویسی مەزرینگەیی› ٦. ماشێنی هاتوچۆ پێکردنی ڕێخراوەیەک ‹سرویسی کارخانە› ٧. ڕێخراوەی ڕاژەیی/ خزمەتگوزاری ‹سرویسی پۆستی› ٨. ژوور و کەلوپەلی شتوشۆر ‹وارخانێک بە دوو ژوور، هاڵ و سرویسێکەوە› ٩. *[وەرزش]* کاری هاویشتنی تۆپ بۆ وەگەڕ خستنی کایە یان درێژە پێدانی (لە برێ یاری وەک والیباڵ و تنیسدا) ☰ ١تا٩.

سرویس

**سرۆ**[١] / s(i)ro/: ناو. زەڕووەرەق؛ پەڕەیەكی ناسك و نەرمی كانزایی، زۆرتر بۆ شت تێوە پێچان ≡ كاغذ آلومنیومی

▪ **سرۆ**[٢]: پاشەوشە. ـ وێژ (چەقەسرۆ) ≡ ـ گو

**سرووت** / s(i)rût/: ناو. سوریت؛ كلۆش؛ لاسكی گەنم و جۆ ≡ ساقەی گندم و جو

**سروود** / s(i)rûd/: ناو. نەشید؛ باو: ١. خوێندنێكی كرژ و هەستبزوێن كە زۆرتر بە كۆمەڵ و لە كۆڕێكی فەرمیدا دەیخوێنن ٢. مارش؛ مووسیقای ئاوا خوێندنێك ٣. هۆنراوە؛ گۆرانی؛ هەڵبەستێكی كورت كە بۆ گۆرانی هۆنراوەتەوە ≡ ١تا٣. سرود

▣ **سروودی نەتەوەیی**: سروودێك كە لە لایەن دەوڵەتەوە بۆ ژەندن لە ڕێوڕەسمی فەرمیدا هەڵبژێردراوە ≡ سرود ملی

**سرووش** / s(i)rûş/: ناو. جبرائیل؛ فرشتەی پەیامبەر ≡ جبرائیل

**سرە** / s(i)re/: ناو. سەرە؛ نۆبە؛ نۆرە؛ باو ≡ نوبت

**سرەفت** / s(i)reft/: ☜ **سرەوت**

**سرەفتن** / s(i)reftin/: ☜ **سرەوتن**

**سرەوان** / s(i)rewan/: چاوگ. ١. ☜ **سرەوتن** ٢. لێ دان؛ تێسرەواندن ≡ ١. ☜ **سرەوتن** ٢. زدن

**سرەواندن** / s(i)rewandin/: چاوگ. تێپەڕ. //سرەواندت؛ دەسرەوێنی؛ بسرەوێنە// سرواندن؛ سروانن؛ سرەوانن: ١. ئارام كردنەوە ٢. تێسرەواندن ≡ ١. آرام كردن ٢. زدن

■ ئاوەڵناوی بەركاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەسرەواندن

**سرەوانن** / s(i)rewanin/: ☜ **سرەواندن**

**سرەوای** / s(i)reway/: چاوگ. سرەوان ≡ آرمیدن

**سرەوت** / s(i)rewt/: ناو. سرەفت؛ ئۆقرە؛ هەدا؛ نەبوون یا نەمانی: ئـ) هەراوهوریا ب) ئاژاوە پ) ژان و ئێش ت) خەم و مەینەت ج) هەڕەشە و ترس ≡ آرامش

▣ **سرەوت كردن**: ئارام كردن؛ سرەواندن ≡ آرام كردن

**سرەوت گرتن**: ☜ **سرەوتن**

**سرەوتن** / s(i)rewtin/: چاوگ. تێنەپەڕ. //سرەوتی؛ دەسرەوی؛ بسرەوە// سرفتن؛ سرەفتن؛ سرەوان؛ سرەوین؛ سرەوت گرتن؛ ئۆقرە گرتن؛ هەدا دان (لە ئێوارەوە بە ڕوودا كەوتم/ نە خوا دای شیفا، نە خۆم سرەوتم «فولكلۆر») ≡ آرمیدن؛ آرام گرفتن

■ ئاوەڵناوی بەركاری: سرەوتوو/ چاوگی نەرێنی: نەسرەوتن

**سرەوتوو** / s(i)rewtû/: ئاوەڵناو. ئۆقرەگرتوو ≡ آرمیده

**سرەوین** / s(i)rewîn/: چاوگ. ١. ☜ **سرەوتن** ٢. لێ دان؛ تێسرەواندن ≡ ١. ☜ **سرەوتن** ٢. زدن

**سریاڵ** / siryał/: ناو. ڕێسە؛ زنجیرە؛ كۆمەڵێك بەش كە یەك لە شوێن یەك بڵاو دەبێتەوە ≡ سریال

**سریش** / s(i)rîş/: ☜ **سریش**

**سریلە** / s(i)rîle/: ناو. ١. زریلە؛ مەلێكە لە تۆرەمەی چوڕە، نزیك ١٧ سانتیمیترە، دوو پەڕی ڕەش وەك شاخ لە سەری قیت بووە، لە ناو بەردان هێلانە دەكا ٢. سیسرك؛ سیسرە؛ مێروویەكی وەك كوللەیە شەوان سیرەی دێ ≡ ١. چكاوك شاخدار ٢. جیرجیرك

**سریمە** / s(i)rîme/: ناو. ژانی بە هۆی برینداربوون، نەخۆشی و... ≡ درد در اثر زخم، بیماری و ...

**سرینچك** / s(i)rînçik/: ناو. سنجوو؛ سنجۆ؛ سنجۆك؛ سرنچك؛ سرنیچك؛ سرێنجگ؛ سرنجگ؛ سرنجی؛ سینچك؛ سنج؛ سنجە؛ سەنجیە؛ سنجی؛ سنجەی؛ سنجەوی؛ سینجی؛ سنجید؛ گوسنج؛ ئاردگن؛ ئاردەگن؛ ئیگدێ؛ ئیگدی: ١. داری سنجوو و هاوماڵەكانی كە

دارێکی دڕکاوییە گەڵاکانی لە گەڵا بی دەچێ، هێشووەگوڵی سپی و بۆنخۆش دەکا ٢. بەری پێگەیشتووی ئەو دارە کە ئەوەندەی زەیتوونێکە، بە تێکوڵی زەرد، نارنجی یان سوور، گۆشتی سپی وەک ئارد، کە ماکی قەندی تێدایە و ناوکێکی درێژۆکەی لووسی چێوییەوە ☰ ١و٢. سنجد

**سـرینچکەتاڵە / s(i)rînç(i)ketałe/**: ناو. سنجووەتاڵە؛ دارێکی لێرەواری جوانە بە گەڵای پێکهاتوو لە وردەگەڵای نووکتیژ و ددانەدار، گوڵی بنەوشی هێشوویی و بۆنخۆش و بەری زەرد و ژەهراوی بە قەد نۆکێک بە ناوکەی ڕەقەوە ☰ سنجد تلخ

**سرینگ / s(i)rîng/**: ☜ **سرنگ**

**سریوە / s(i)rîwe/**: ناو. ١. سروە؛ شنە ٢. جریوەی چۆلەکە ٣. زریوەی ئەستێرە ‹تۆ جریوەی دارستانی جێژوانی/ بۆ هەسێرەی بەرزی ئاواتم سریوەی، چەند جوانی «سوارە»› ☰ ١. نسیم ٢. جیک ـ جیک گنجشکان ٣. چشمک ستارگان

**سرێش / s(i)rêş/**: ناو. خوژە؛ خوژێ؛ سریش؛ چریش؛ چرێش؛ شریژ؛ شیرێز؛ شەیژ؛ شریش؛ شرێس؛ شرێش؛ ئەسرێلک؛ ئەستریلک؛ ئەسترێلک؛ ئەسریلک؛ زرێچ: ١. ماسرێشمە؛ گیاچرێش؛ گوولک؛ سترک؛ گیایەکی خۆڕسکی بێلاسک، بە گوڵی دڕکاوی و بنجکی ئەستوورەوە ٢. گەردێکی نەرم کە لە بنجی وشکەوەکراوی گیای سرێش دەگیردرێ ☰ ١و٢. سریش

**سرێشلەمە / s(i)rêşleme/**: ناو. *[کینایە]* کاری ناتەواو ☰ کار ناتمام

**سرێشمە / s(i)rêşme/**: ناو. سرێشەجاڕ ☰ سریش زار

**سرێشەجاڕ / s(i)rêşecař/**: ناو. سرێشمە ☰ سریش زار

**سرینجگ / s(i)rêncig/**: ☜ **سرینچك**

**سـڕ[1] / siř/**: ناو. ١. بای سارد ٢. گووفک؛ سەرانگوێلک؛ پاکوت؛ جێ کۆی پەین ٣. نهێنی؛ ڕاز ٤. چالاکی و بزاو؛ توند و تۆڵی ‹تە پیر بووی، سڕا تە قەمری› ☰ ١. باد سرد ٢. جای تودەی سرگین ٣. راز ۴. توان و حرکت

**سڕ[2]**: ئاوەڵناو. ١. کەرخ؛ کەسیرە؛ تەزیو ٢. قەڕس؛ قەسر؛ بێهەست ‹دوکتور دەدانی بۆ سڕ کردم و پڕی کردەوە› ☰ ١. کرخت ٢. بیحس

◘ **سڕ بوون**: ١. تەزین؛ کەرخین ٢. بێهەست بوون ☰ ١. کرخت شدن ٢. بیحس شدن

**سڕ کردن**: ١. بێهەست کردن ٢. *[کینایە]* سڕ کردنەوە؛ هەڵپەساردن؛ بۆ ماوەیەک قسە لێوە نەکردن ‹باسی سەربەخۆیی جارێ سڕ دەکەین› ☰ ١. بیحس کردن ٢. مُعلَّق کردن

**سڕ کردنەوە**: ☜ **سڕ کردن ـ٢**

▪ **سڕ[3]**: پاشەوشە. ١. ـ سڕە؛ پاککەرەوە ‹دەسەسڕ› ٢. ـ لابەر ‹لەکەسڕ› ☰ ١. ـ مال ٢. ـ زُدا

**سڕنووش / siřnûş/**: ناو. خەفزان؛ غەیبوێژ؛ ئەوەی لە نهێنی هەواڵ دەدا ☰ غیبگو

**سڕان / s(i)řan/**: چاوگ. سڕیان؛ ئەستڕان ☰ سُتردە شدن

**سـڕاندنەوە / s(i)řand(i)newe/**: چاوگ. ئەستڕینەوە ☰ سُتردن

**سڕانەوە / s(i)řanewe/**: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //سڕایەوە؛ دەسڕێیەوە؛ بسڕێوە// سڕیانەوە؛ پاک بوونەوە ☰ سُتردە شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: سڕاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەسڕانەوە

**سڕاو / s(i)řaw/**: ئاوەڵناو. مەحو؛ هەشفی؛ مەحف ☰ محو

**سـڕبڕی / siřb(i)rî/**: ئاوەڵناو. سەرمابردوو ☰

سرمازده

**سڕبڕی** / sîřb(i)řî/: ناو. سەرمای زۆر توند ☰ سرمای شدید

**سڕبو** / sîřbû/: ئاوەڵناو. تەزی؛ تەزیو ☰ بی‌حس

**سڕد**[1] / sîřd/: ناو. تازە گوڵی خەڵە ☰ خوشەی نودمیدەی غلە

**سڕد**[2]: ئاوەڵناو. سرت؛ ڕەوەک؛ قوشقی ☰ رموک

**سڕدین** / sîřdîn/: چاوگ. ۱. تازە وە گوڵ هاتنی خەڵە ۲. ڕەوینەوە؛ سڵەمینەوە ☰ ۱. نوبردمیدن خوشەی غلە ۲. رمیدن

**سڕسواڵکەر** / sîřs(i)wałker/: ☜ **سەرسواڵکەر**

**سڕقایم** / sîřqayim/: ئاوەڵناو. ڕازدار؛ ڕازهەڵگر؛ ڕازگر؛ پارێزەری ڕازی دیتران ☰ رازدار

**سڕکەر** / sîřker/: تەزێنەر؛ لەگۆبەر ☰ بی‌حس کنندە

**سڕکەوان** / sîřkewan/: ناو. سەرەنوێلک؛ پاکوت؛ جێگەی پەین و پاڵ ☰ سرگینگاه

**سڕمە** / sîřme/: ناو. سمڕ؛ هەراوهوریا ☰ جنجال

**سڕمەسڕم** / sîřmesîřm/: ناو. هەراهەرا و غەڵبەغەڵب ☰ همهمە و جنجال

**سڕنا** / sîřna/: ناو. زڕنا؛ زوڕنا؛ سڕناوی؛ سوڕنا؛ سازێکی باژەنە بە شێوەی لوولەیەکی سەرقووچ بە شەش تا حەوت کونەوە کە بە قامک دەیژەنن ☰ سُرنا

**سڕناتک** / sîřnatik/: ☜ **زوڕناتك**

**سڕناژەن** / sîřnajen/: ناو. زڕنەڤان؛ زوڕناچی؛ زوڕناژەن؛ سوڕناژەن ☰ سُرنازن

**سڕناوی** / sîřnawî/: ☜ **سڕنا**

**سڕنی** / sîřnî/: ناو. عەرابەی کەلان؛ عەرەبانەیەک کە دوو کەڵ دەیانکێشا ☰ ارادەای کە دو گاو آن را می‌کشیدند

**سڕوڕ** / s(i)řuř/: ئاوەڵناو. پتەو؛ قایم؛ ڕەختە ☰ مُحکم

**سڕوسارد** / sîř û sard/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* کەمدوو؛ بێ‌مەیل. هەروەها: **سڕوساردی** ☰ سردمزاج

**سڕوسەپۆل** / sîř û sepol/: ☜ **سڕەسەپۆلە**

**سڕوسیپاڵ** / sîř û sîpał/: ناو. سیپاڵ و شتی وا ‹سێلاو هێرش دەکا ... زۆربەی خەڵکی شار لە باغاتی خوارووی شار سەیران دەکەن، دەست دەکەن بە گرتنەوەی سڕوسیپاڵی ئاوماڵک ... «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ خرت‌وپرت

**سڕە**[1] / s(i)ře/: ناو. ۱. بای سارد ۲. شەختەی پاییز ۳. کەمرە؛ گەمڕە؛ ڕیخ و شیاکەی پەستاوتەی وشک ☰ ۱. باد سرد ۲. سرمای نابهنگام پاییز ۳. سرگین خشک شدە

**سڕە**[2]: ئاوەڵناو. باسڕە؛ باسەرە؛ باگرە؛ بەربا؛ بائەنگێو؛ تایبەتمەندی شوێنێ کە با بیگرێ ☰ بادگیر

• **سڕە**[3]: پاشەوشە. ـ سڕ؛ خاوێن‌کەرەوە ‹دەسەسڕە› ☰ ـ مال

**سڕەسەپۆلە** / s(i)řesepole/: ئاوەڵناو. *[پلار]* سڕوسەپۆل؛ سەرسەپۆل؛ گێژ و کاس و هیچنەزان ☰ گیج و منگ

**سڕەمۆک** / s(i)řemok/: ناو. بەرسیلە؛ پەسیرە؛ پەرسیلە؛ پەسیلە؛ هالە؛ هالێ؛ ترێی کاڵی سەوز و ترش ☰ غورە

**سڕی** / s(i)řî/: ناو. ۱. کەرخی؛ تەزیوی ۲. قەرسی؛ بێ‌هەستی ☰ ۱. کرختی ۲. بی‌حسی

**سڕیان** / sîřyan/: ☜ **سڕان**

**سڕیانەوە** / sîřyanewe/: ☜ **سڕانەوە**

**سڕیای** / sîřyay/: چاوگ. سڕیان؛ ئەستران ☰ ستُردە شدن

**سڕین** / s(i)řîn/: چاوگ. ۱. ئەسترین؛ ڤەسڕین؛ سەڕتەی؛ هەشڤاندن؛ هەشڤین؛ پاک کردنەوە ‹ئای لە ژێر قورسایی بارا/ ئارەقی ناوچاومان سڕی! «گۆران»› ۲. چڕین؛ بانگ کردن ☰ ۱. زدودن؛ ستُردن ۲. صدا زدن

**سڕینەوە** / s(i)řînewe/: چاوگ. تێپەڕ. //سڕیتەوە؛ دەسڕییەوە؛ بسڕەوە// ١. ئەستڕینەوە؛ لابردنی پەڵە یان خەت و ... ‹شەنگەبێری! بسڕەوە فرمێسکی بێشوانی ئێتر/ ڕەنگە هێشتا لەو چیا و زۆزانە بۆ شوان ببمەوە! «هێمن»› ٢. خاوێن کردنەوە (بە پەڕۆ و ...) ☰ ١. سُتُردن ٢. تمیز کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەسڕینەوە

**سزا** / siza/: ناو. ١. جزیا؛ دەرد و ئازار ‹تۆ سەرەوش بەو سەیر سەفای بەختەوە/ من وێڵ ـ وێڵ وەی زام سزای سەختەوە «مەولەوی»› ٢. سزیا؛ جزیا؛ تاوان ٣. پاداش؛ ڕێزانە ☰ ١. درد؛ آزار ٢. مُجازات ٣. پاداش

**سزا چەشتن**: سزا چێشتن/ چەشین؛ سزا دین/ دیتن: ١. تووشی ڕەنج و ئازار بوون ٢. جزیا دران ☰ ١. درد چشیدن ٢. مُجازات شُدن

**سزا چێشتن/ چەشین**: ☜ **سزا چەشتن**

**سزا خواردن**: تووشی ئازار بوون ☰ آزار چشیدن

**سزا دان**: ئازار دان ☰ شکنجه کردن

**سزا دانەوە**: ١. تۆڵە بۆ کردنەوە ٢. تۆڵە لێ سەندنەوە ☰ ١. جبران کردن ٢. انتقام گرفتن

**سزا دران**: تووشی ئازار و ئەشکەنجە هاتن ☰ آزار دیدن

**سزا دین/ دیتن**: ☜ **سزا چەشتن**

**سزاخانە** / sizaxane/: ناو. جێگەی ئازار دان ☰ شکنجەگاه

**سزانن** / sizanin/: ☜ **سوتاندن**

**سزاو** / sizaw/: ناو. ئاوی لە ماستی ناو توورەکە تکاو ☰ آب چکیده از ماست کیسه

**سزرگە** / sizirge/: ناو. موچڕک؛ تەزووی لەش ☰ مور ـ مور

**سزک** / sizik/: ☜ **سزگ**

**سزگ** / sizig/: ناو. سزک؛ سزگاو؛ سزی: ١. ئاوی پەنیر، کە لۆرکی لێ دەگرن ٢. تیژاوی دۆ، کە دەکرێتە شیرێژ ☰ ١. آب پنیر ٢. تیزاب دوغ

**سزگاو** / sizgaw/: ☜ **سزگ**

**سزە** / size/: ناو. تەزووی سەرما ☰ سوز سرما

**سزی** / sizî/: ☜ **سزگ**

**سزیان** / sizyan/: چاوگ. سووتان؛ سووتیان ☰ سوختن

**سژ** / sij/: ☜ **سج**

**سس** / sis/: ☜ **سست**

**سسارک** / sisark/: ☜ **سیسارک**

**سست** / sist/: ئاوەڵناو. سس: ١. شل و خۆ نەگرتوو؛ ناپتەو ‹بینای سست› ٢. خاو؛ شل و شەوێق؛ خلیچک؛ تەمەڵ؛ بێهێز ‹میللەتێ گەر گەنجی سست بێ، مردووە، میللەت نییە/ تاکوو مابێ، نێو دەروونی بێجەفا و عیللەت نییە «دڵدار»› ☰ ١. سُست ٢. بی‌حال و تنبل

⊡ **سست بوونەوە**: ١. داهێزان؛ شل و خاو بوونەوە؛ کز بوون ٢. شل بوونەوە؛ دڵسارد بوون ☰ ١. ضعیف شدن ٢. دلسرد شدن

**سستوپەلەشت** / sist û peleşt/: ئاوەڵناو. [پەلار] تەمەڵ و هیچلێنەهاتوو ☰ تنبل و بیکاره

**سستەر** / sister/: ☜ **سیستر**

**سستەسست** / sistesist/: ئاوڵکار. شلەشل؛ بە هێواشی و بێتاقەتی ☰ شُل و وِل

**سستەک** / sistek/: ناو. سسە؛ زەوی شلی ناپتەو ☰ زمین سُست

**سستی** / sistî/: ناو. شل و شەوێقی؛ تەمەڵی؛ لەش‌گرانی ☰ سُستی

**سسڵە** / sisłe/: ناو. زنجیرۆکەی زەنبەر ☰ زنجیر زینتی

**سسە** / sise/: ☜ **سستەک**

**سسی** / sisî/: ناو. دانۆکە کەنگر ☰ کنگردانه

**سعووتی** / s(i)'ûtî/: ناو. بڕنووتی؛ نشووک ☰ انفیه

**سعوود** / s(i)'ûd/: ناو. بەخت؛ تاڵە؛ تالح ☗ بخت

**سغ** / siğ/: ☜ سخ

**سف** / sif/: ☜ سفت

**سفارش** / s(i)fariş/: ناو. داخوازی؛ داوخوازی؛ ڕاسپێری ☗ سفارش

**سفت** / sift/: ئاوەڵناو. سف؛ سخ؛ ڕەق؛ زوا؛ زوها: ١. پتەو؛ ڕەپ؛ سەخت؛ سرت ‹داری سفت› ٢. کزر؛ وشک؛ کڕ؛ پند؛ پندر؛ پنر؛ ڕەق و بێئاو ‹خۆراکی سفت› ☗ ١و٢. سفت

◘ **سفت بوون**: سخ بوون. هەروەها: **سفت بوونەوە؛ سفت کردنەوە** ☗ سفت شدن

**سفتۆ بوون**: داهێزان؛ لەش گران بوون ☗ کسل شدن

**سفتاح** / siftaĥ/: ناو. دەشت؛ هەوەڵفرۆش ☗ دشت

**سفتکار** / siftkar/: ئاوەڵناو. سفتەکار؛ بنەڕەت دانەر و دروستکەری دیوار و میچی ماڵ ☗ سفتکار

**سفتکاری** / siftkarî/: ناو. سفتەکاری؛ بەشێ لە ڕەوتی بیناسازی، بریتی لە بنەڕەت دانان، دیوار هەڵچنین و سەر گرتنی ☗ سفتکاری

**سفتوسادە** / sift û sade/: ئاوەڵناو. ڕەپوڕەوان؛ ڕاشکاوانە ☗ رُک و صریح

**سفتوسوێ** / sift û s(i)wê/: ناو. سفتوسۆ؛ چۆنیەتی چووزانەوە؛ تووزانەوە ‹دەست بە دەست چوو تا گەیشتە دەستی عەتتاری سەفیە/ نایە سەر نار و عەزابی ڕۆحی داو و سفتوسوێ «نالی»› ☗ سوزش زخم

**سفتوسۆ** / sift û so/: ☜ سفتوسوێ

**سفتوسۆڵ**[1] / sift û sol/: ئاوەڵناو. ١. سخ و ساف و لووس ٢. توند و تۆڵ ☗ ١. سِفت و صاف ٢. تُند و محکم

**سفتوسۆڵ**[2]: ئاوەڵکار. ڕاست و بێگرێ؛ بە ڕاشکاوی ‹فرە سفتوسۆڵ جواوی داوە› ☗ رُک و صریح

**سفتۆ** / sifto/: ئاوەڵناو. بۆگەن؛ بۆگەنیو ☗ بدبو

**سفتۆک** / siftok/: ئاوەڵناو. گەنیوی ڕزیو (میوە) ☗ گندیده (میوه)

**سفتە**[1] / sifte/: ناو. ١. ڕیایی؛ ڕووبینی ٢. پسوولەی حەواڵە؛ بەڵگەیێ کە بە پێی ئەوە، کەسێ دانەوەی پارەیێ لە وادەیەکی دیاریکراودا وە ئەستۆ دەگرێ ٣. گیایەکە بۆ مالات ☗ ١. تملُق ٢. سفته ٣. گیاهی است

**سفتە**[2]: ئاوەڵناو. ١. ساویاو؛ حولیبووگ ٢. سووتاو ☗ ١. سائیده‌ی صاف شده ٢. سوخته

**سفتەک** / siftek/: ناو. دارێکی لێرەوارە بەرێکی شیرین دەدا و گەڵای لە گەڵای زەیتوون دەکا ☗ درختی جنگلی

**سفتەکار** / siftekar/: ☜ سفتکار

**سفتەکاری** / siftekarî/: ☜ سفتکاری

**سفتی** / siftî/: ناو. ١. دۆخی سفت بوون ٢. توندی تەنراو ٣. گۆژمی؛ پتەوی ☗ ١. حالت سِفت بودن ٢. سفتی بافت ٣. سختی

**سفتیک** / siftîk/: ناو. دەشتایی نێوان کێوان ☗ وادی

**سفر** / sif(i)r/: ☜ سیفر

**سفرە** / sifre/: ناو. ١. خوان؛ سەخردان؛ تفال؛ کەوڵی نان ‹سفرەی پڕ، ئاشتی ماڵە «مەسەل»› ٢. *[مەجاز]* ئەوەی لە سەر خوان دادەنرێت ‹سفرەی ڕەنگین› ٣. *[زەویناسی]* چینێک لە ماکی کانی لە ژێر زەوی کە ناوچەیەکی داگرتووە ☗ ١تا٣. سُفره

◙ **سفرەی فەقیران**: سفرەی فەقییان؛ هەشت ئەستێرەی کۆ لە بورجی دووپشک و میزان ☗ هشت ستاره در میان برج عقرب و میزان

**سفرەی فەقییان**: ☜ سفرەی فەقیران

◘ **سفرە داخستن**: ☜ سفرە ڕاخستن

**سفرە ڕاخستن**: سفرە داخستن؛ ڕاخستنی خوان

🇮🇷 سُفره انداختن

**سفرەبڕ** / sifrebiř/: ☜ **سیسرك**

**سفرەبڕە** / sifreb(i)ře/: ☜ **سیسرك**

**سفرەچی** / sifreçî/: ناو. پێشخزمەت؛ گارسۆن؛ خزمەتکاری پیاو لە میوانخانە و ڕستووران 🇮🇷 گارسُن

**سفرەدڕ** / sifrediř/: ئاوەڵناو. [کنایە] ناسپاس؛ سپڵە؛ سفلە؛ پێنەزان 🇮🇷 ناسپاس

**سفرەمار** / sifremar/: ☜ **ڕەقەمار**

**سفرەماسی** / sifremasî/: ناو. ماسی کارتووخک؛ جۆرێک ماسی دەریا بە لەشی پان و تەختەوە 🇮🇷 سُفرەماهی

**سفری** / sifrî/: ناو. ئەستێ و بەردی تفەنگی سەرپڕ 🇮🇷 سنگ آتشزنەی تفنگ سرپُر

**سفک**[1] / sifik/: ناو. ۱. بەرهەیوان؛ بانجێلە؛ هەیوانەکلێ ۲. کۆست؛ لەمپەر؛ بلندایی سەر ڕێگە 🇮🇷 ۱. ایوانگاه ۲. مانع راه

**سفک**[2]: ئاوەڵناو. سووک؛ دژی گران و سەنگین 🇮🇷 سبُک

**سفکی** / sifkî/: ناو. سووکی؛ دژی قورسی و سەنگینی 🇮🇷 سبُکی

**سفلیس** / siflîs/: ناو. فەرنگی؛ هالۆق؛ بای بوور؛ پەتایەکی کۆن کردووی ئەندامانی شەرم 🇮🇷 سفلیس

**سفلە** / sifle/: ☜ **سپڵە**

**سفن** / sifin/: ناو. ماک؛ بنەما؛ ڕەگ و ڕیشە 🇮🇷 بیخ و بن

**سفنک** / sifnik/: ناو. هیم؛ خیم؛ تەمەڵە؛ بناغە؛ بەردی بناخە 🇮🇷 بنای ساختمان

**سفۆر** / s(i)for/: ☜ **سمۆرە ـ۱**

**سفۆری** / s(i)forî/: ناو. سفۆری؛ باڵاپۆش لە کەوڵی سمۆرە 🇮🇷 جبّە از پوست سمور

**سفوور**[1] / s(i)fûr/: ناو. ☜ **سپوور**

**سفوور**[2]: ئاوەڵناو. شارستانی بێڕووپۆش ‹کچەکەم سفوور بوو، بەرچاوی بوو› 🇮🇷 شهری بی‌حجاب

**سفووک** / s(i)fûk/: ☜ **سماق**

**سفەت** / s(i)fet/: ناو. ۱. دانستە؛ تایبەتمەندی شت یا کەسێ کە بەوەوە بناسرێت ۲. [ڕێزمان] ئاوەڵناو ۳. [مەجاز] ئەمەگ؛ وەفا 🇮🇷 ۱و۲. صفت ۳. وفا

**سفەتدار** / s(i)fetdar/: ئاوەڵناو. پێزان؛ بەئەمەگ 🇮🇷 باوفا

**سفی** / s(i)fî/: ناو/ ئاوەڵناو. سپی؛ چەرمگ؛ چەرمە 🇮🇷 سفید

**سفێدە** / s(i)fêde/: ☜ **سپیدە**

**سڤ** / siv/: ناو. پەرسڤ؛ جواو 🇮🇷 پاسخ

**سڤاڵە** / s(i)vale/: ☜ **سواڵە**

**سڤاندە** / s(i)vande/: ☜ **سوانە**

**سڤدر** / sivdir/: ☜ **سڤدە**

**سڤدە** / sivde/: ناو. سڤدر؛ سەردەرانەی بە خشت هەڵچنراو 🇮🇷 آستانەی در

**سڤسڤیلک** / sivs(i)vîlik/: ناو. مەلێکی پچووکی ڕەنگاوڕەنگە 🇮🇷 گنجشک‌سانی رنگارنگ

**سڤک** / sivik/: ☜ **سوك**[2]

**سڤکۆک** / sivkok/: ئاوەڵناو. سڤیلانک؛ زۆر سووک 🇮🇷 بسیار سبک

**سڤکی** / siv(i)kî/: ☜ **سوکی**

**سڤنک** / sivink/: ناو. گەسک؛ گزگ 🇮🇷 جارو

**سڤنگ** / siving/: ناو. چنگە کلۆشێ کە پشتی گاگێرەی پێ دەماڵن 🇮🇷 دسته‌ای از ساقه‌ی غله که پشت گاو خرمنکوب را بدان تمیز کنند

**سڤۆرە** / s(i)vore/: ☜ **سمۆرە ـ۱**

**سڤۆری** / s(i)vorî/: ☜ **سفۆری**

**سڤۆک** / s(i)vok/: ناو. سفووک؛ سماق 🇮🇷 سُماق

**سڤووک** / s(i)vûk/: ☜ **سڤۆك**

**سڤی** / s(i)vî/: ناو. کەپەک؛ سەرهێڵەگ 🇮🇷 نُخاله

**سڤیشک / s(i)vîşik/**: ناو. دوودڵی؛ دڕدۆنگی ☰ بدگمانی

**سڤیک / s(i)vîk/**: ناو. ١. میچ؛ بنمیچ؛ سەرمیچ ٢. بەرهەیوانۆکە ٣. گەسک؛ گزگ ☰ ١. سقف ٢. تراس کوچک ٣. جارو

**سڤیل[1] / s(i)vîl/**: ناو. سویل: ١. شارۆمەند؛ کەس یان کەسانێ کە بە خەڵکی شار یان وڵاتێک دێنە ئەژمار ٢. کەس یان کەسانی ناچەکدار ٣. کەسێ کە جلکی ئورووپایی لە بەردا بێ ☰ ١. شهروند ٢. غیرنظامی ٣. کسی در لباس غربی

**سڤیل[2]**: ئاوەڵناو. ١. شارۆمەندی؛ سەر بە خەڵکی شار ‹هەشت ڕێکخراوەی سڤیل لە پارێزگای دهۆک کەمپینێکیان ڕێک خست› ٢. ناچەکداری ‹خەڵکی سڤیل بوونە قوربانی شەڕ› ٣. بە جلوبەرگی ئەورووپایی ☰ ١. شهروندی ٢. غیرنظامی ٣. لباس اروپایی بر تن

**سڤیلانک / s(i)vîlanik/**: ☜ **سڤکۆک**

**سڤێری / s(i)vêrî/**: ناو. گیایەکە لە جۆ دەکا ☰ گیاهی شبیه جو

**سقان[1] / s(i)qan/**: چاوگ. تیژ کردن و سوونەوەی تیخ ☰ تیز کردن تیغ

**سقان[2]**: ☜ **ئێسک**

**سقانژان / s(i)qanjan/**: ناو. باداری؛ ڕوماتیسم؛ نەخۆشی و ژانی جومگە ☰ رُماتیسم

**سق ـ سق / siqsiq/**: دەنگەناو. جیڕەجیڕ؛ دەنگی دەرگای شڕ و کەوشی تازە و ... ☰ جر ـ جر

**سقڵ / siqił/**: ناو. گرفت؛ سەردڵ؛ نەخۆشی قورس بوون و داهێزانی زگ لەبەر پڕی گەدە ☰ رودل

**سقڵمە / siqiłme/**: ☜ **سخورمە**

**سقمە / siqme/**: ئاوەڵناو. تێرگۆشتی لەبار (بۆ ژن) ☰ پُرگوشتِ خوش‌تیپ (زن)

**سقێف / s(i)qêf/**: ☜ **سخێف**

**سک[1] / sik/**: ناو. ١. زگ؛ زک؛ ورگ و ناو ‹سکی برسی! هیچ ناپرسی «مەسەل»› ٢. پیزە؛ تۆل ٣. *[مەجاز]* کۆئەندامی هەرس ‹سکم کار ناکا› ٤. بەشی دەرپەڕیوی هەر شتێ (وەک شیشە و گۆزە) ٥. جاری زاوزێ ‹حەوت سکی بووە› ٦. ناو و دەروونی هەر شتێ ‹سکی پڕ لە زووخ› ☰ ١. شکم ٢. جنین ٣تا٦. شکم

⊡ **سک بوون**: *[کینایە]* دووگیان بوون ☰ حامله بودن

**سک بەردان**: *[مەجاز]* سک نانە سەر؛ زگ بەردان؛ زۆر خواردن ☰ پُرخوری کردن

**سک تاو دان**: *[مەجاز]* بە هیوای خواردنی شتێکی تایبەت بوون ☰ شکم خود را صابون زدن

**سک چوون**: *[مەجاز]* سک ڕۆین؛ زگ چوون ☰ اسهال شدن

**سک دان**: *[کینایە]* لە ناوەڕاستەوە دەرپەڕین ☰ ورآمدن

**سک ڕۆین**: ☜ **سك چوون**

**سک سووتان**: *[کینایە]* زگ سووتان ☰ مُردن فرزند

**سک کار کردن**: دەرکردنی پیسایی ڕیخۆڵە ☰ شکم کار کردن

**سک کردن**: *[کینایە]* زگ کردن ☰ بچه آوردن

**سک نانە سەر**: ☜ **سك بەردان**

**سکی کەسێک قوپان**: *[مەجاز]* لە بەر برسییەتی زۆر لاواز بوون ☰ شکم کسی به پشت چسبیدن

**سکی کەسێک تێر بوون**: ١. کەسێ مڕ بوون ٢. *[کینایە]* دەوڵەمەند بوون؛ باری ئابووری و ژیواری کەسێ لەبار بوون ‹تا سکی کەسێک تێرە، لە حالی برسی نازانێ› ☰ ١و٢. شکم کسی سیر بودن

**نیانە سک**: *[مەجاز]* چار کردن؛ دەرەقەت هاتن؛ لە عۆدە هاتن ‹ئەم گامانە نانێتە سک کەڵەگاکە› ☰ حریف شدن

**سک[2]**: ئاوەڵناو. ناحەز؛ ناشیرین ☰ زشت

**سکاسن** / s(i)kasin/: ناو. دەرمانی چەرم ڕەنگ کردن ☰ رنگِ ویژەی چرم

**سکاڵا** / s(i)kała/: ناو. ١. ڕاز و نیاز؛ وتوویژی خۆشەویستانە ‹یان بیری لە دەوری مەم دەهالا/ دەمدەم دەگەلی دەکرد سکالا «هەژار، مەم‌وزین»› ٢. گلەیی؛ سوو؛ گلەوبناشت ‹زۆر سکالای لێت بوو› ٣. گازە؛ گازندە؛ داد؛ شکایەت ‹فۆرمی سکالای هاوولاتییان› ٤. تەگبیر؛ چارەدۆزی؛ بیری چارە ☰ ١. راز و نیاز ٢. گِلە ٣. شکایت ۴. چارەجویی

**سکاڵانووس** / s(i)kałanûs/: ناو. دادنووس؛ ڕازنووس ☰ عریضەنویس

**سکاڵە** / s(i)kałe/: ناو. ١. شکات؛ شکایەت؛ داد ٢. کاری پاڕانەوە ☰ ١. شکایت ٢. التماس

**سکاڵەبەر** / s(i)kałaber/: ناو. دادبەر؛ دادخواز؛ سکالەبەر؛ شکایەت‌کەر ☰ شاکی؛ دادخواه

**سکان**[1] / s(i)kan/: چاوگ. چەسپین؛ لکان ☰ چسبیدن

**سکان**[2]: ناو. جنێو؛ دژمان ☰ دُشنام

**سکاندیوم** / s(i)kandyum/: ناو. توخمی کیمیاوی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ٢١ و کێشی ئەتومی ٤٤,٩٥ ☰ اسکاندیُم

**سکانن** / s(i)kanin/: چاوگ. ١. چەسپاندن؛ لکاندن ٢. جوێن دان ☰ ١. چسباندن ٢. دُشنام دادن

**سکبەن** / sikben/: ناو. زکوێن؛ شالێکی پانی پارچەیی بە ئالقەزوونەوە بۆ بەرگری لە داچۆڕانی ماسوولکەکانی زک ☰ شکم‌بند

**سکپ** / sik(i)p/: ناو. سکف؛ بنڕێسمە ☰ چوب پاشنەی در

**سکپڕ** / sikpiř/: ئاوەڵناو. هەمیلا؛ زکپڕ؛ ئاوس ☰ باردار

**سکتر** / siktir/: ئاوەڵناو. بێدەنگ لە ناچاری ☰ خاموش از سر ناچاری

**سکدار** / sikdar/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* دووگیان؛ زگدار ☰ آبستن

**سکدڕاو** / skid(i)řaw/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* زگدڕاو؛ فرەخوەر؛ زۆرخۆر ☰ پرخور

**سکر** / sikr/: ناو. ١. پاڵوێنەی لە تووڵ چندراو ٢. بەربەندی ئاو بە تووڵ و گیا ☰ ١. پالونه از ترکه ٢. سد آب از ترکه و گیاه

**سکرتێر** / s(i)kirtêr/: ناو. ئینشابەند؛ دەبیر ☰ مُنشی

**سکزل** / sikzil/: ئاوەڵناو. زگزل ☰ شکم گُنده

**سکف** / sikif/: ☜ **سکپ**

**سککە** / sikke/: ناو. ١. گوڵمێخ ٢. سکە؛ قەرەپووڵ؛ پارەی لە کانزا ☰ ١. میخ طویله ٢. سکه؛ پول فلزی

**سکلەوەڕێن** / sikleweřên/: ئاوەڵناو. *[پەلار]* زگلەوەڕێن ☰ سورچران

**سکڵ** / sikił/: ناو. سکەڵ؛ پۆلوو؛ پەنگر؛ پەرەنگ؛ پەن؛ پن ☰ اخگر

⊡ **سکڵ خستن:** بوونە سکڵی چڵوچێو ☰ تبدیل به اخگر شدن

**سکڵ لە دما بوون:** *[مەجاز]* زۆر توند و بە پەلە قسە کردن ‹لە سەر خۆ قسە بکە! ئێژی سکڵ لە دەمتایە› ☰ تند و ناشمرده حرف زدن

**سکڵفوو** / sikiłfû/: ناو. سکڵی بە فوان؛ گەمەیەکە سکڵ بە دەرزی و بەنێکەوە هەڵدەواسن و بەرەو یەکتر فووی لێ دەکەن ☰ نوعی بازی با اخگر

**سکڵی بەفوان** / sikłî be f(i)wan/: ☜ **سکڵفوو**

**سکماک** / sikmak/: ئاوەڵناو. زگماک ☰ مادرزاد

**سکن** / sikin/: ئاوەڵناو. *[پەلار]* زگن: ١. زگزل ٢. چڵێس ☰ ١. شکم‌گنده ٢. شکم‌پرست

**سکنی** / siknî/: ناو. زگەڕۆیی؛ زگنی؛ زگێنی؛ چڵێسی ☰ شکمویی

**سکور** / sikur/: ناو. سکورد؛ ستۆکرک؛ ناق؛ قوڕاچکە ☰ خرخرە

**سکورد** / sikurd/: ☜ **سکور**

**سکوزا** / sik û za/: ناو. سکوزان؛ زگوزا ☰ زاد و ولد

▣ **سکوزا کردن:** زگوزا کردن؛ زاوزێ کردن؛ بێچوو هێنان و تۆرەمە خستنەوە ☰ زادوولد کردن

**سکوزان** / sik û zan/: ☜ **سکوزا**

**سکوم** / s(i)kum/: ناو. سەروسەکوت؛ تەرح و دیدار ☰ سیما

**سکە** / s(i)ke/: ناو. ١. سکوم؛ سەروسەکوت ٢. دراو؛ پارەی کانزایی؛ زێڕ، زیو یان هەر کانزایەکی دە قاڵبکراوی نووسراوی ولاتێک ☰ ١. سیما ٢. سکّە

▣ **سکە لێدان:** ١. دراوی کانزایی کوتان ‹دەوڵەت سکەی ٥٠٠ تمەنی لێداوە› ٢. *[مەجاز]* کاری زۆر باش و بە قازانج کردن ☰ ١و٢. سکّە زدن

**سکەخزێ** / s(i)kex(i)zê/: ☜ **سکەخشکێ**

**سکەخشکە** / s(i)kexişke/: ☜ **سکەخشکێ**

**سکەخشکێ** / s(i)kexişkê/: ناو. سکەخزێ؛ سکەخشکە؛ سکەخشێ؛ دۆخی بە سەر سکدا ڕۆیشتن ☰ سینەخیز

**سکەخشێ** / s(i)kex(i)şê/: ☜ **سکەخشکێ**

**سکەڕۆ** / s(i)keřo/: ناوەڵناو. *[پلار]* چڵێس؛ زکەڕۆ ☰ شکم‌پرست

**سکەشۆرە** / s(i)keşore/: ناو. سکەشۆڕە؛ سکەشۆری؛ زگچوون ☰ اسهال

**سکەشۆری** / s(i)keşorî/: ☜ **سکەشۆرە**

**سکەشۆڕە** / s(i)keşoře/: ☜ **سکەشۆرە**

**سکەڵ** / s(i)keł/: ☜ **سکڵ**

**سکەنجەبین** / s(i)kencebîn/: ناو. سکەنجەمین؛ ئەسکەنجەبین؛ ئەسکەنجەمین؛ شەربەتی سرکە و هەنگوین ☰ سکنجبین

**سکەنجەمین** / s(i)kencemîn/: ☜ **سکەنجەبین**

**سکێشە** / s(i)kêşe/: ناو. زگئێشە ☰ شکم درد

**سگار** / s(i)gar/: ☜ **سیگار**

**سگارکێش** / s(i)garkêş/: ☜ **سیگاری**

**سگاری** / s(i)garî/: ☜ **سیگاری**

**سگڵ** / sigił/: ناو. بالووک؛ بالووکە ☰ زگیل

**سگوڕ** / s(i)guř/: ناو. گوێلکی زۆر قەڵەوی غلوور ☰ گوسالەی درشت و مغرور

**سگین** / s(i)gîn/: ناو. *[شووروەیی]* گانی سەگ؛ چۆنیەتی جووت بوونی گۆڵ و دێڵ ☰ جفت‌گیری سگ

**سل**[1] / sil/: ناو. ١. سنلە؛ تەپە گوو ٢. دەردەباریکە؛ سیل ☰ ١. سندە ٢. بیماری سل

▣ **سل سارد بونەوە:** *[پلار]* سل سەردەو بوون؛ لاق جووت بوون؛ ئاوی ژیان هێنق کردن؛ مردنی ناحەز ☰ مُردن بدسگال

**سل سارد کردنەوە:** *[پلار]* کوشتنی نەگەویست ☰ کشتن دشمن

**سل سەردەو بون:** ☜ **سل سارد بونەوە**

**سل**[2]: ناوەڵناو. ١. تووڕە؛ قەڵس ٢. سرت؛ قوشقی ☰ ١. خشمگین ٢. رموک

▣ **سل بین:** ☜ **سڵ بون**

**سلاح** / s(i)laĥ/: ناو. چەک؛ ئەسپابی شەڕ ☰ جنگ افزار؛ سلاح

**سلار** / s(i)lar/: ناوەڵناو. تخێل؛ ڕاست بە عەرزا درێژبوو ☰ دراز کشیده بر زمین

▣ **سلار بون:** تخێل بوون؛ تەختی زەوی بوون ☰ دراز به دراز افتادن

**سلار بونەوە:** ١. درێژەوە بوون ٢. *[کینایە]* لاق جووت بوون؛ مردن ‹بۆ خۆشی کەنفت بووە و هەر بینا سلار بۆوە «هێمن»› ☰ ١. دراز به دراز افتادن ٢. مُردن

**سلاق** / s(i)laq/: ☜ **سماق**

**سلتێنی** / siltênî/: ناو. سلووهی؛ زەوی بەشی دوو ڕۆژە جووت ⇆ زمین به اندازەی دو روز شخم زدن با گاو

**سلخە** / silxe/: ناو. ١. ڕنوو؛ ڕنی؛ هەرەس ٢. گاشەبەردی زل ⇆ ١. بهمن ٢. صخرەی بزرگ

**سلسار** / silsar/: ئاوەڵناو. بێشەرم؛ بێحەیا ⇆ بیشرم

**سلف** / silf/: ناو. سڵپ؛ تلپ ⇆ تفاله

**سلک**[١] / silk/: ☜ **سڵق**

⊡ **سلکێ سوێ**: چەوەندەری خۆماڵی ⇆ چغندر

**سلک**[٢]: ئاوەڵناو. سرک؛ ڕەوەک ⇆ رموک

**سلکاندن** / silkandin/: چاوگ. دوورەپەرێزی کردن لە خەڵک ⇆ مُنزوی شدن

**سلکیان** / silk(i)yan/: ☜ **سلکین**

**سلکین** / silkîn/: چاوگ. سلکیان؛ سڕدین؛ سڵ کردن؛ ڕەوینەوە ⇆ رمیدن

**سللول** / sillul/: ☜ **سالول**

**سلم** / silm/: ناو. ڕەو؛ قوشقیبەتی ⇆ رم

**سلماستک** / silmastik/: ناو. گیایەکە ⇆ گیاهی است

**سلمتە** / silm(i)te/: ناو. بژار ⇆ وجین

**سلمو** / silmû/: ئاوەڵناو. ڕەوەک ⇆ رموک

**سلنگ** / s(i)ling/: ناو. دەیلەم؛ دەڵەم؛ مێڵەیەکی ئاسنی بە سەرێکی پانەوە بۆ شکاندن و کون کردنی بەرد، دیوار و ... ⇆ دیلم

**سلنیوم** / siln(i)yum/: ناو. توخمی کیمیاوی ناکانزا، بە ژمارەی ئەتومی ٣٤، کێشی ئەتومی ٧٨,٩٦ و بە ڕواڵەتێکی کانزایی و بە ڕەنگی خۆڵەمێشی کە لە ئاودا ناتوێتەوە ⇆ سلنیُم

**سلۆری** / s(i)lorî/: ناو. پێت؛ گڕی ئاگر ⇆ زبانەی آتش

**سلوهی** / s(i)lûhî/: ☜ **سلتێنی**

**سلەزەوە** / s(i)lezewe/: ناو. زیتکەسلام؛ قنچکەسلاو ⇆ گُل‌مُژە

**سلەم** / s(i)lem/: ناو. سولەم؛ پەیجە؛ پەیژە؛ نەردیوان ⇆ نردبان

**سلەمەڕ** / s(i)lemeř/: ناو. پشکەڵی تەڕی پێکەوەنووساوی مەڕ ⇆ پشکل بە هم چسبیدە و خیس گوسفند

**سلەوەجە** / s(i)lewece/: ☜ **سلەوەجێ**

**سلەوەجێ** / s(i)lewecê/: ناو. سلەوەجە؛ نەخۆشییەکی پەزە ⇆ نوعی بیماری گوسفند

**سلی** / s(i)lî/: ناو. ١. ڕەوەکییەتی ٢. توورەیی؛ قەڵسی ⇆ ١. رمیدگی ٢. خشم

**سلیک** / s(i)lîk/: ناو. دڕک ⇆ خار

**سلیمۆتەوەرە** / s(i)lîmotewere/: ناو. پەپووسلێمانکە ⇆ هُدهُد

**سلیمانی** / s(i)lêmanî/: ناو. ١. جۆرێ مووروی ژنانە ٢. جۆرێ ترێ ⇆ ١. نوعی مُهرەی زینتی ٢. نوعی انگور

**سڵ**[١] / sił/: ناو. کاری سڵەمینەوە ⇆ رم

⊡ **سڵ کردن**: ١. ڕەوینەوە ‹ئەم دێیە جێ دێڵم؛ بێنیشان، بێشوێن پێ/ ئەی پەری! سڵ مەکە، لا مەدە بۆ لارێ «گۆران»› ٢. *[کینایە]* پارێز کردن؛ خۆ بواردن؛ تەکینەوە ‹کچی میر و گەدا دڵیان هەیە دڵ/ دڵیش ناکا لە دڵداری و ئەوین سڵ «هێمن»› ⇆ ١. رمیدن ٢. پرهیز کردن

**سڵ**[٢]: ئاوەڵناو. ١. سرک؛ سوڵ؛ ڕەوەک ‹شەوێ لە بیرەخەودا جەماڵی ویم بە دڵ دی/ دوو چاوی مەست و کاڵم وەکوو غەزاڵی سڵ دی «وەفایی»› ٢. *[مەجاز]* توورە؛ قەڵس ⇆ ١. رموک ٢. عصبانی

⊡ **سڵ بوون**: سل بین: ١. قوت بوون؛ سرک بوون ٢. توورە بوون؛ قەڵس بوون‹تاژدین بە مەمی دەگوت ئەتۆ کێی/ مەم سڵ بوو پتر لە ڕاستی هاوڕێی « هەژار، *مەم و زین*»› ⇆ ١. رموک بودن

٢. خشمگین شدن

**سلا** / s(i)ła/: ☜ **سلان**

**سلاحنای** / s(i)łaĥnay/: چاوگ. گونجاندن ☰ سازش دادن

**سلاحیای** / s(i)łaĥyay/: چاوگ. گونجان ☰ سازش کردن

**سلاڤ** / s(i)łav/: ☜ **سەلام**

**سلام** / s(i)łam/: ☜ **سەلام**

▣ **سلام دانەوە:** *[ئیسلام]* نوێژ تەواو کردن ☰ تمام کردن نماز

**سلامانە** / s(i)łamane/: ناو. سەوقات؛ دەسەدیاری؛ دیاری مسافر کە لە گەڕانەوەدا لەگەڵ خۆی دەیهێنێ ☰ رەآورد سفر؛ ارمغان

**سلامەت** / s(i)łamet/: ئاوەڵناو. سەلامەت؛ ساق؛ ساخ ☰ سلامت

**سلامەتی** / s(i)łametî/: ناو. سەلامەتی؛ ساقی؛ ساخی؛ ساغی ☰ سلامت

**سلامەلێ** / s(i)łamelê/: ☜ **سەلام**

**سلامەلێک** / s(i)łamelêk/: ☜ **سەلام**

**سلان** / s(i)łan/: ناو. سەلان؛ سلا؛ کێوان؛ بلندیان ☰ ارتفاعات

**سلاو** / s(i)ław/: ناو. ١. ☜ **سەلام** ٢. پارسەنگی تەرازوو ☰ ١. ☜ **سەلام** ٢. پارسنگ ترازو

▣ **سلاو دانەوە:** ١. *[کینایە]* تۆزێک گران کێشانی تەرازوو بۆ دڵخۆشی کڕیار ٢. *[ئیسلام]* وتنی ڕستەی «السّلامُ علیکُم و رحمَةُ الله و برکاتُه» لە کۆتایی نوێژدا ☰ ١. خاطرانە؛ کمی گران کشیدن ترازو ٢. سلام دادن پایان نماز

**سلاوات** / s(i)ławat/: ☜ **سەڵوات**

**سلاوەت** / s(i)ławet/: ☜ **سەڵوات**

**سڵپ**[1] / siłp/: ناو. تلف؛ تلتە؛ تلپ؛ سلپە ☰ تفالە

**سڵپ**[2]: ئاوەڵناو. تەپ؛ تەوەزەل ☰ سُست و تنبل

**سڵپات** / siłpat/: ☜ **تلفار**

**سڵپاتە** / siłpate/: ☜ **زەلاتە**

**سڵپۆت** / siłpot/: ☜ **سپلۆت**

**سڵپە** / siłpe/: ☜ **سلپ**[1]

**سڵتان** / siłtan/: ☜ **سوڵتان**

▣ **سڵتان سەر:** تەوقی سەر؛ تەپلەسەر ☰ تارک

**سڵسلە** / siłs(i)łe/: ناو. سسلە ☰ زنجیر زینتی

**سڵق** / siłq/: ناو. سرق؛ سلک؛ زلق؛ گیایەکی دەسچێنە لە چەوەندەر دەکا ☰ سلق؛ گیاهی از تیرەی چغندر

▣ **سڵقی ڕووت:** *[پلار]* ڕووت و نەداری بێهیچ شت ☰ آسمان جُل

**سڵقاو** / siłqaw/: ناو. شێوی سلق ☰ نوعی آش

**سڵکەر** / siłker/: ئاوەڵناو. سلۆک ☰ رموک

**سڵکین** / siłkîn/: چاوگ. سلەمان؛ سل کردن ☰ رمیدن

**سڵمۆچک** / siłmoçik/: ☜ **سمۆچك**

**سڵوقەڵس** / sił û qełs/: ئاوەڵناو. تیزۆ؛ هەڵتۆزێن ☰ پرخاشگر

**سڵۆک** / s(i)łok/: ئاوەڵناو. سلکەر؛ ڕەوەک ☰ رموک

**سڵەمان** / s(i)łeman/: چاوگ. تێپەڕ. //سلەمای؛ دەسلەمێی؛ بسلەمێ// سل کردن؛ سلکین؛ سلەمین؛ سڕدین؛ ڕەو کردن ‹تەنانەت لە پشیلەش ئەسلەمێتەوە› ☰ رمیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: سلەماو/ چاوگی نەرێنی: نەسلەمان

**سڵەماندن** / s(i)łemandin/: چاوگ. تێپەڕ. //سلەماندت؛ دەسلەمێنی؛ بسلەمێنە// سل پێکردن ☰ رم دادن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەسلەماندن

**سڵەماندنەوە** / s(i)łemand(i)newe/: چاوگ. ڕەواندنەوە ‹لەپڕ شریخەی هەور سلەماندینیەوە› ☰ رم دادن

**سلەمانەوە** / s(i)łemanewe/: ☜ **سلەمینەوە**

**سلەمکە** / s(i)łemke/: ناو. گیایەکە لە دۆکلیوی دەکەن 🇮🇷 گیاهی خوراکی

**سلەمنای** / s(i)łemnay/: چاوگ. سلەماندن 🇮🇷 رم دادن

**سلەمنایوە** / s(i)łemnaywe/: چاوگ. سلەماندنەوە 🇮🇷 رم دادن

**سلەمنایۆ** / s(i)łemnayo/: چاوگ. سلەماندنەوە 🇮🇷 رم دادن

**سلەمە** / s(i)łeme/: ناو. ڕەو 🇮🇷 رم

**سلەمیانەوە** / s(i)łemyanewe/: ☜ **سلەمینەوە**

**سلەمیای** / s(i)łemyay/: چاوگ. سلەمان 🇮🇷 رم کردن

**سلەمیایوە** / s(i)łemyaywe/: چاوگ. سلەمانەوە 🇮🇷 رم کردن

**سلەمیایۆ** / s(i)łemyayo/: چاوگ. سلەمانەوە 🇮🇷 رم کردن

**سلەمین** / s(i)łemîn/: ☜ **سلەمان**

**سلەمینەوە** / s(i)łemînewe/: چاوگ. تێنەپەڕ. //سلەمیتەوە؛ دەسلەمیەوە؛ بسلەمەوە// سلەمانەوە؛ سلەمیانەوە؛ سلەوینەوە؛ سلەویانەوە؛ ڕەوینەوە 🇮🇷 رم کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: سلەمیوەوە/ چاوگی نەرێتی: نەسلەمینەوە

**سلەویانەوە** / s(i)łewyanewe/: ☜ **سلەمینەوە**

**سلەوینەوە** / s(i)łewînewe/: ☜ **سلەمینەوە**

**سڵی** / s(i)łî/: ناو. ڕەوەکیەتی 🇮🇷 رمیدگی

**سڵیە** / siłye/: ناو. فیشەک 🇮🇷 فشنگ

**سلێمانی** / s(i)łêmanî/: ناو. ١. مووررووی سلێمانی ٢. نازناوی پەپوو ‹پەپوو سلێمانی دەردم نیەزانی/ چەو ئەبروو مشکی مالم ڕمانی «فولکلۆر»› 🇮🇷 ١. نوعی مُهرەی زینتی ٢. لقب هُدهُد

**سم**[1] / sim/: ناو. سوم؛ چم؛ پۆشەنی ڕەق و شاخینی پەلی برێ لە چوارپێیان 🇮🇷 سُم

▪ **سم**[2]: پاشەوشە. کونکەر ‹دیوارسم› 🇮🇷 ـ کاو

**سمات** / s(i)mat/: ناو. کەمرە؛ گەمڕە؛ گەڕمە 🇮🇷 سرگین سفت شده

**سماتە** / s(i)mate/: ناو. سمارتە: ١. بەردێکی ڕەشی زبر و زۆر سەختە ٢. جۆرە قاغەزێکی زبرە ئاسن و داری پێ لووس دەکەن 🇮🇷 ١. سنگی سخت و سیاه ٢. سُنباده

**سماخ** / s(i)max/: ناو. ١. کاری ئاو دانی تیخ ٢. ☜ **سماق** 🇮🇷 ١. عمل آب دادن تیغ ٢. ☜ **سماق**

**سماخکری** / s(i)maxk(i)rî/: ناو. تیخی ئاودراو 🇮🇷 تیغ آب‌دیده

**سمارتە** / s(i)marte/: ناو. ١. سماتە ٢. ☜ **سمبڕ** 🇮🇷 ١. سنباده ٢. ☜ **سمبڕ**

**سماق** / s(i)maq/: ناو. سماخ؛ سوماخ؛ سلاق؛ سمۆق؛ سپووک؛ سقۆک؛ سقووک؛ سفووک؛ شۆک؛ توتوم؛ تووتووم؛ توتم؛ تەتەری؛ تمتم؛ تومتم؛ ترش: ١. دارچکێکی گچکە، بە لق‌وپۆی کورکداری خۆلەمێشی کە لە وەرزی پاییزدا گەڵاکانی سوور دەبن ٢. دەنکی ترشی داری سماق بە تۆزی سوورەوە کە هێشووئاسایە، هاڕدراوەکەی بۆ چێژ و دەرمان بەکار دێ 🇮🇷 ١و٢. سُماق

⊡ **سماق دەرێنان**: */کنایە/* جەزرەبە دانی زۆر 🇮🇷 آزار دادن بسیار

**سماقان** / s(i)maqan/: ناو. شوێنێ کە زۆری دار سماق لێ ڕواوە 🇮🇷 سُماقزار

**سماقاو** / s(i)maqaw/: ناو. جل‌بڕووکە؛ مزراویلکە؛ ترشاو؛ چێشتی سماق 🇮🇷 آش سُماق

**سماق‌پاڵان** / s(i)maqpałan/: ناو. سووزمە؛ پاڵوێنەی کانزا بۆ پاڵاوتنی برنج 🇮🇷 آبکش فلزی

**سماقە** / s(i)maqe/: ناو. ڕەوەنج؛ ڕەقیتە؛ نەخۆشی لەش ڕەق بوونی ئاژەڵ لە سەرماوە 🇮🇷

نوعی بیماری دام

**سمان** / s(i)man/: چاوگ. تێپەڕ. //سمای؛ دەسمێی؛ بسمێ// سمیان؛ کون بوون 🇮🇷 سوراخ شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: سماو/ چاوگی نەرێنی: نەسمان

**سماندن** / s(i)mandin/: چاوگ. سمین؛ کون کردن 🇮🇷 سوراخ کردن

**سماو** / s(i)maw/: ئاوەڵناو. کون‌کراو 🇮🇷 سوراخ‌شده

**سمای** / s(i)may/: چاوگ. سماندن؛ سمین 🇮🇷 سوراخ کردن

**سمایلۆک** / s(i)maylok/: ناو. پیرخەنیلە؛ چێشتی دانەوێڵە 🇮🇷 آش بلغور

**سمبڕ** / simbiř/: ناو. سمارتە؛ سمتاش؛ سمتراش؛ سمتەراش؛ ئامرازی سم تاشین 🇮🇷 سُمتراش

**سمبل** / simbil/: ناو. ئاوێ کە بە خێر دەدرێ 🇮🇷 آب خیراتی

**سمبلاک** / simb(i)lak/: ☜ سمبەلاک

**سمبلاندن** / simb(i)landin/: چاوگ. تازە سمێڵ بۆر بوون؛ تازە خەت دان 🇮🇷 پا به سن بلوغ گذاشتن (پسران)

**سمبڵ** / simbił/: ☜ سمێڵ

**سمبۆرە** / simbore/: ☜ سمۆرە ـ۱

**سمبە** / simbe/: ناو. شغاب؛ سمە؛ مەتکەو 🇮🇷 متّه

**سمبەری** / simberî/: ناو. جۆرێ داری بێ‌بەر 🇮🇷 درختی است بی‌ثمر

**سمبەلاک** / simb(i)lak/: ناو. سمەلەک؛ سمبلاک؛ زەردەماسی 🇮🇷 ماهی اوزون‌برون

**سمبێل** / simbêl/: ☜ سمێڵ

**سمبێلۆک** / simbêlok/: ناو. گوڵێکی بۆنخۆشە 🇮🇷 گلی خوشبو

**سمبێلەک** / simbêlek/: ناو. زەردەماسی 🇮🇷 نوعی ماهی زردرنگ

**سمبێڵ** / simbêł/: ☜ سمێڵ

**سمبێڵبۆق** / simbêłboq/: ☜ سمێڵبۆق

**سمبێڵتەنک** / simbêłtenik/: ☜ سمێڵفش

**سمبێڵشۆڕ** / simbêłşoř/: ☜ سمێڵشۆڕ

**سمپارە** / simpare/: ناو. سماتە؛ کاغەزی تەختە و ئاسن لووس کردن 🇮🇷 سُنباده

**سمپووتی** / simpûtî/: ناو. سمکۆڵ؛ سمکۆلان 🇮🇷 سُمکوبی

**سمت** / simt/: ناو. ۱. لاقوون؛ ئەستوورایی بەر کەمەر ۲. کونی دەسکرد 🇮🇷 ۱. باسن ۲. سوراخ مصنوعی

**سمتاش** / simtaş/: ☜ سمبڕ

**سمتاندن** / simtandin/: چاوگ. سمتانن؛ سمین؛ کون کردن 🇮🇷 سوراخ کردن

**سمتانن** / simtanin/: ☜ سمتاندن

**سمتخوار** / simtx(i)war/: ئاوەڵناو. هێت‌خوار؛ هێڕ؛ گێڕ 🇮🇷 باسن کج

**سمتراش** / simt(i)raş/: ☜ سمبڕ

**سمتزەلام** / simtzelam/: ئاوەڵناو. قوون‌دەهۆڵ؛ قنگ‌زل 🇮🇷 باسن گنده

**سمتن** / simtin/: چاوگ. سمین؛ کون کردن 🇮🇷 سوراخ کردن

**سمتوساتان** / simt û satan/: ناو. /*شوورەیی*/ دیمەنی سمتی ژنی پێکەوتوو ‹کچەتیو سمتوساتانی ڕادەنێ!› 🇮🇷 جلوەی باسن زن خوش‌اندام

**سمتۆک** / simtok/: ئاوەڵناو. کون‌کەر 🇮🇷 سوراخ‌کننده

**سمتۆڵ** / simtoł/: ناو. سمت؛ لاقوون؛ کەفەڵی مرۆ 🇮🇷 باسن

**سمتو** / simtû/: ☜ شووتی

**سمتە** / simte/: ناو. سندە؛ سنە؛ تۆڵا؛ وردی زۆری پێکەوە نووساو 🇮🇷 چگال

**سمتەراش** / simteraş/: ☜ سمبڕ

**سمتەگڵ** / simtegił/: ناو. سندە؛ سندەگڵ؛ کلۆ؛

گلی پێکەوە چەسپاوی زەلام 🇮🇷 کلوخ

**سمتی** / simtî/: ☜ **شوتی**

**سمتین** / simtîn/: چاوگ. ١. سمتن؛ کون کردن ٢. سمران؛ کون کران 🇮🇷 ١. سوراخ کردن ٢. سوراخ شدن

**سمدار** / simdar/: ئاوەڵناو. بەسم 🇮🇷 دارای سُم

**سمدمد** / s(i)midmid/: ناو. خەزایی؛ عایلەمەن 🇮🇷 سار صورتی

**سمران** / simran/: چاوگ. تێنەپەر. نادیار. //سمرای؛ دەسمرێی؛ بسمرێ// کون کران 🇮🇷 سوراخ شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: سمراو/ چاوگی نەرێنی: نەسمران

**سمڕ** / s(i)miř/: ناو. سرمە؛ هەراوهوریا 🇮🇷 جنجال

**سمراخە** / simřaxe/: ناو. چلکی گوێ 🇮🇷 چرک گوش

**سمڕان** / simřan/: ← **تێکسمڕان**

**سمڕاو** / simřaw/: ← **تێکسمڕاو**

**سمڕ ـ سمڕ** / s(i)miř s(i)miř/: ناو. سیمڕ ـ سیمڕ ١. هەرا و دەمەقاڵە ٢. سپڕ ـ سپڕ؛ زۆر ـ زۆران ‹ئەم هەوڵ و سمڕ ـ سمڕە بۆ دوو تیکە نانە› ٣. کاری پێ چەقاندن؛ پێ داگرتن 🇮🇷 ١. جنجال و نزاع ٢. حالت زور زدن و فشار آوردن ٣. پافشاری

**سمڕە** / simře/: ناو. پاشەڵی دووگی مەڕ و بەران 🇮🇷 دنبالەی دُمبەی گوسفند

**سمڕەشی** / simřeşî/: ناو. نەخۆشییەکی ئاژەڵە 🇮🇷 نوعی بیماری دام

**سمسا** / simsa/: ناو. گیایەکی بۆنخۆشە 🇮🇷 گیاهی خوشبو

**سمسار** / simsar/: ناو. سمسێر؛ ناڤبێژ؛ ناڤچیت؛ کۆنەفرۆش؛ کەسێ کەل‌وپەلی دەکار کراوی ماڵان دان‌وسان دەکا 🇮🇷 سمسار

**سمسارک** / simsarik/: ☜ **سیسارک**

**سمساری** / simsarî/: ناو. ١. کاری ناڤبێژ ٢. دووکان دەستەدوو؛ شوێنێ کەل‌وپەلی دەستەدووی تێدا دان‌وسان دەکرێ 🇮🇷 ١و٢. سمساری

**سمسک** / simsik/: ئاوەڵناو. چاوپیس؛ شووم؛ نەفەس‌پیس 🇮🇷 شوم

**سمسیرە** / simsîre/: ناو. تلفی ترێی گوشراو؛ تلتەهەنگوور 🇮🇷 تُفالەی انگور

**سمسێر** / simsêr/: ☜ **سمسار**

**سمقە** / simqe/: ناو. زەوی نەرم و ڕاست کە بێ جووت لێ دان، چەڵتووکی لێ دەچێنن 🇮🇷 زمین هموار و نرم که بدون شخم، شالی در آن می‌کارند

**سمکاک** / simkak/: ناو. بەری گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ 🇮🇷 دانەی گیاهی دارویی

**سمکوت** / simkut/: ئاوەڵناو. بە سم کوتراو 🇮🇷 سُمکوب

**سمکوڕدک** / simkuřdik/: ☜ **سمکۆد**

**سمکولی** / simkulî/: ناو. نەخۆشی سمی ئاژەڵ 🇮🇷 بیماری سُم حیوان

**سمکۆ** / simko/: ناو. سمکۆڵ؛ سمکۆلان؛ سمەکرێ؛ سمکۆلان؛ سمەکوتێ: ١. کاری دەست بە زەویدا کوتانی وڵاخی بەرزە ٢. پێکوڵ؛ سم بە زەویدا خشاندنی جوانە گا کاتی شەڕ کردن 🇮🇷 ١. عمل سُم بر زمین کوبیدن اسب ٢. عمل سُم بر زمین کشیدن گاو جوان پیش از حمله

**سمکۆت** / simkot/: ناو. کەوجێز؛ کەفچی گەورەی دارین 🇮🇷 قاشق بزرگ چوبین

**سمکۆد** / simkod/: ئاوەڵناو. سمکوڕدک؛ سمکۆدک؛ سم گەورە 🇮🇷 پیل‌سُم

**سمکۆدک** / simkodik/: ☜ **سمکۆد**

**سمکۆک** / simkok/: ناو. گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ 🇮🇷 گیاهی دارویی

**سمکۆلان** / simkolan/: ☜ **سمکۆ**

**سمکۆڵ** / simkoł/: ☜ **سمکۆ**

**سمکۆڵان** / simkołan/: ☜ **سمکۆ**

**سمکۆ** / simkû/: ناو. پاشێل؛ پێشێل؛ پاکوت ▬ لگدمال

**سملەتیف** / simletîf/: ناو. سونبلەتیف؛ ڕیخەداروو؛ گیاکتک ▬ سُنبُل‌الطیب؛ علف گربه

**سمڵ** / sim(i)ł/: ناو. ١. سۆتکە؛ گیایەکە بنێکی بۆنخۆشی هەیە و دەرمانیشە ٢. سوێنکە؛ هەلال؛ سیاوسەدە؛ سنبل؛ بنێکی گوڵ بنەوشی جوان و بۆنخۆشە ٣. گەردانەی مێخەک؛ مێخەکبەند ▬ ١. مُشک زمین ٢. گیاه سُنبل ٣. گردنبند از میخک

**سمنت** / simint/: ناو. سمیت؛ چیمەنتۆ ▬ سیمان

**سمنج** / siminc/: ئاوەڵناو. ١. پێچەقێن؛ پێداگر؛ خووگرتوو بە پا دانە گەز و ڕەقاندنەوەی زۆر و نابەجێ ٢. ڕژد؛ ڕەزیل ٣. سەرسەخت و نەگونجاو ▬ ١. سِمج ٢. خسیس ٣. لجوج و غیرمنطقی

**سمۆ** / s(i)mo/: ناو. سمە؛ مەتکەو؛ ئامرازی شت کون کردن ▬ متّه

**سمۆچک** / s(i)moçik/: ناو. سلمۆچک؛ سمۆرچکە؛ قەڵشاوی ناو سم؛ نێوان سمی ئاژەڵی جووتسم ▬ شکاف سُم حیوان

**سمۆر** / s(i)mor/: ☜ **سمۆرە ـ١**

**سمۆرتە** / s(i)morte/: ناو. سامۆرتە؛ بەن‌سامۆرتە ▬ بند فتراک

**سمۆرچکە** / s(i)morç(i)ke/: ☜ **سمۆچك**

**سمۆرە** / s(i)more/: ناو. ١. سمۆر؛ ساموور؛ سفۆر؛ سڤۆرە؛ سمبۆرە؛ سمۆلەک؛ سووری؛ سەفۆر؛ سەفۆری؛ سەموور؛ سهۆری؛ گوهانداریکی گۆشتخۆری وەک پشیلەیە بە جەستەیەکی گچکەی باریک و کێشراو، پێی کورت، کەوڵی نەرم و تووکی خورمایی یان ڕەش و خۆڵەمێشییە ٢. سنجاو؛ سەنجاب ▬ ١. سمور ٢. سنجاب

**سمۆق** / s(i)moq/: ☜ **سماق**

**سمۆقی** / s(i)moqî/: ئاوەڵناو. بە ڕەنگی سماق ▬ به رنگ سُماق

**سمۆک** / s(i)mok/: ناو. پانچ؛ ئامرازی کون کردن ▬ پانچ

**سمۆلەک** / s(i)molek/: ☜ **سمۆرە ـ١**

**سمە**[1] / s(i)me/: ناو. مەتە؛ مەتکەو؛ ئامرازی کون کردن ▬ متّه

▪ **سمە**[2]: پاشەوشە. کونکەر ‹دارەسمە› ▬ ـ سُفت

**سمەخرتە**[1] / s(i)mexirte/: ناو. جانەوەریکی دەست و پێ کورتە ▬ جیوانی دست و پا کوتاه

**سمەخرتە**[2]: ئاوەڵناو. *[پلار]* باوەعەمرە؛ باواقۆرەت ▬ کوتوله

**سمەخۆرکە** / s(i)mexorke/: ناو. نەخۆشییەکی ماڵاتە ▬ نوعی بیماری دام

**سمەر** / s(i)mer/: ناو. کا؛ ساقەتە دەخلی وردکراو ▬ کاه

**سمەری** / s(i)merî/: ناو. ١. کا؛ ساقەتەی ورد کراوی دەخڵ ٢. کای کۆن و ڕزیو ▬ ١. کاه ٢. کاه کُهنه و پوسیده

**سمەسا** / s(i)mesa/: ناو. کونەدیواری بابوێر ▬ سوراخ بادکش در دیوار

**سمەشلە** / s(i)meş(i)le/: ☜ **سمەشەلە**

**سمەشەلە** / s(i)meşele/: ناو. سمەشلە؛ سمکولی؛ نەخۆشی سمی ئاژەڵ ▬ بیماری سُم حیوان

**سمەک** / s(i)mek/: ناو. مەتکەو؛ سمە؛ ئامرازی کون کردن ▬ متُه

**سمەکرێ** / s(i)mek(i)řê/: ناو. ☜ **سمکۆ**

**سمەکوتێ** / s(i)mekutê/: ☜ **سمکۆ**

**سمەلەک** / s(i)melek/: ☜ **سمبەلاك**

**سمەلۆچکە** / s(i)mełoçke/: ناو. قیتکەی پشتی سمی ئاژەڵ ▬ زایدەی پُشت سُم چهارپایان

**سمەوچ** / s(i)mewiç/: ناو. جۆرێ تۆمی گەنم ▬ نوعی بذر گندم

**سمەوشتر** / s(i)mewiştir/: ناو. تاپان 🇮🇷 پایِ‌شُتُر

**سمەوەج** / s(i)mewec/: ناو. جۆرێ گەنم 🇮🇷 نوعی گندم

**سمیارک** / simyarik/: ☜ **سیسارگ**

**سمیان** / simyan/: ☜ **سمان**

**سمیت** / s(i)mît/: ناو. ١. جۆرێ نانی بە ئالقەی ڕەق ٢. سمنت؛ چیمەنتۆ 🇮🇷 ١. نوعی نان ٢. سیمان

**سمیتک** / s(i)mîtik/: ناو. ١. سندک؛ شلەبرووش؛ بروێشین؛ برێش؛ چێشتی وردە ساواری تراو ٢. گرالک؛ گڕالک؛ بنە گیایەکە زوو زەرد دەبێ و زۆرتر دەیسووتێنن، گوڵێکی چکۆلەی بنەوش دەکا، ئاوی کولاوی زیپکە و خرووی لەش دادەمرکێنێ 🇮🇷 ١. آش بلغور آبکی ٢. بوتەای صحرایی

**سمین** / s(i)mîn/: چاوگ. تێپەر. //سمیت؛ دەسمی؛ بسمە// کون کردن 🇮🇷 سوراخ کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: سمیو/ چاوگی نەرێنی: نەسمین

**سمێر** / s(i)mêř/: ناو. دۆخی پتەو بوونی ئەندام 🇮🇷 توپُری اندام

**سمێریان** / s(i)mêřyan/: چاوگ. پتەو بوونی ئەندام؛ تێک‌سمڕان 🇮🇷 توپُر بودن

**سمێڵ** / s(i)mêł/: ناو. سوێڵ؛ سوێل؛ سمبڵ؛ سیوڵ؛ سێوڵ؛ سبیل؛ سمبێل؛ سمبێڵ؛ زمێ؛ زمبێڵ؛ زمێڵ؛ زمیلی؛ مووی ژوور لێوی پیاو و هەندێک گیانەوەری‌تر 🇮🇷 سبیل

⊡ **سمێڵ دانان**: سمێڵ هێشتنەوە ‹سمێڵ دانە! پێت ئەکەفێ› 🇮🇷 سبیل گذاشتن

**سمێڵبابڕ** / s(i)mêłbabiř/: ئاوەڵناو. ١. سمێڵ‌زل ٢. *[مەجاز]* خەڵک‌ترسێن و زۆردار 🇮🇷 ١. سبیل از بناگوش دررفته ٢. بزن‌بهادُر

**سمێڵبۆق** / s(i)mêłboq/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* سمبێڵ‌بۆق؛ سمێڵ‌قیت؛ ئازا و لەخۆبایی 🇮🇷 شجاع مغرور

**سمێڵچەخماخی** / s(i)mêłçexmaxî/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* سمێڵ تیژ و باریک کە دوو سەرەکەی بەرەو ژوور با دراوە 🇮🇷 سبیل چخماقی

**سمێڵچەورانە** / s(i)mêłçewrane/: ناو. *[کینایە]* بەرتیل؛ ڕشفەت 🇮🇷 رشوه

**سمێڵزل** / s(i)mêłzil/: ☜ **زمێڵبۆق**

**سمێڵشۆڕ** / s(i)mêłşoř/: ئاوەڵناو. سمبێڵ‌شۆڕ: ١. بە سمێڵکی درێژو شۆڕەوە ٢. *[پلار]* بێ‌ئاکار و بێ‌ویژدان 🇮🇷 ١. سبیل‌آویزان ٢. پست؛ بدذات

**سمێڵفش** / s(i)mêłfiş/: ئاوەڵناو. سمبێڵ تەنک 🇮🇷 دارای سبیل کم‌پشت

**سمێڵقنج** / s(i)mêłqinc/: ☜ **سمێڵقیت**

**سمێڵقیت** / s(i)mêłqît/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **سمێڵبۆق** ٢. *[کینایە]* سمێڵ‌قنج؛ قۆزی لووتبەرز 🇮🇷 ١. ☜ **سمێڵبۆق** ٢. خوش‌تیپِ مغرور

**سمێلە** / s(i)mêle/: ناو. جۆرێ ماسی 🇮🇷 نوعی ماهی

**سمێلی** / s(i)mêlî/: ئاوەڵناو. زمبێلی؛ زمێلی؛ زمبێلن؛ سوێلی؛ سوێلدار 🇮🇷 سبیلو

**سن** / sin/: ناو. ١. سمتەگڵ؛ کلۆ؛ کەستەک؛ پاژەگلی پێکەوە لکاوی وشک هەڵاتوو ٢. سوون؛ سوونە؛ سنک؛ کیسەڵە؛ قمل؛ ڕەقەک؛ ڕەقک؛ بەلا گەنمە؛ مێروویەکی مێملی گیا، بەتایبەت گەنمە، بە ڕەنگی سەوز، قاوەیی یان ئاوی، کە بۆنێکی ناخۆشیشی هەیە ٣. داری دوو لک کە پێستی نچیری پێ با دەدەن و لە کونی دەری دەکێشن ٤. لووتکەی چیا 🇮🇷 ١. کلوخ ٢. سن؛ آفت گندم ٣. چوبی دوشاخه که پوست شکار را بدان تاب دهند ۴. قلەی کوه

**سناریۆ** / s(i)naryo/: ناو. فیلمنامە؛ داستانی فیلم لە سەر کاغەز 🇮🇷 سناریو

**سنامەکی** / s(i)namekî/: ناو. سەنا؛ سەنامەکی؛ سینامەکی؛ سینەمەکی؛ پنچکە گیایەکی گەرمێنە لە تاقمی گولەئەرخەوان، خۆڕسکە و گۆپکە و میوەکەی زگ ڕەوان دەکا ☰ سنا

**سنان** / s(i)nan/: ☜ **سندان**

**سنبل** / sinbil/: ☜ **سمڵ ـ۲**

**سنپنگ** / sinping/: ناو. گیایەکی بۆنخۆشە دەگەڵ سیراج و پەنیری دەکەن ☰ گیاهی خوشبو کە با شیراز و پنیر آمیزند

**سنت** / sint/: ناو. سنێتر؛ پێن‌دەفە؛ ماکێکە هەنگ دیواری خەڵێفی پێ سواغ دەدا ☰ مادەای کە زنبور بر کندو می‌مالد

**سنتر** / sintir/: ناوەڵناو. بێ دای و بابی ئاوارە (منداڵ).☰ بی‌سرپرست (کودک)

**سنج** / sinc/: ناو. ۱. ☜ **سرینچك** ۲. زەنگۆڵەی زل ۳. ژاڵە؛ لووڕک ☰ ۱. ☜ **سرینچك** ۲. زنگولەی بزرگ ۳. خرزهره

**سنجاخ** / sincax/: ناو. سنجاغ؛ سنجەق؛ دەرزیلەی زەنبەر کە لە پێسیر یان لە پرچ دەدرێ ☰ سنجاق

**سنجاخ‌ڕێژ** / sincaxřêj/: ناوەڵناو. بزمارکوت ☰ میخکوب

**سنجاغ** / sinceğ/: ☜ **سنجاخ**

**سنجان** / sincan/: ناو. ئیستیکانی ناو قەد باریک ☰ استکان کمر باریک

**سنجانە** / sincane/: ناو. لەچک؛ لەچکە؛ لاچک؛ دەسرۆکە؛ سووکەڵە سەرپۆشی سێ‌گۆشی ژنان ☰ لَچَک

**سنجر** / sincir/: ناو. بڵێسەی بەرزی ئاگر ☰ شعلەی بلند آتش

**سنجران** / sinc(i)ran/: چاوگ. سنجرین؛ بڵێسەدار بوونی ئاگر ☰ شعلەور شدن آتش

**سنجراندن** / sinc(i)randin/: چاوگ. وە بڵێسە خستن؛ داخستنی تەندوور؛ تەندوور نێل دان ☰ افروختن تنور

**سنجرین** / sinc(i)rîn/: ☜ **سنجران**

**سنجک** / sincik/: ناو. دەفری گڵین بۆ بن بێشکەی مناڵ ☰ ظرف گلین زیر گهوارەی بچە

**سنجۆ** / sinco/: ☜ **سرینچك**

**سنجۆق** / sincoq/: ناو. ۱. ڕۆخڵەی ئەستوور؛ ڕیخۆڵەی گەورە ۲. ☜ **سجووق** ☰ ۱. رودەی بزرگ ۲. ☜ **سجوق**

**سنجۆک** / sincok/: ☜ **سرینچك**

**سنجوو** / sincû/: ☜ **سرینچك**

**سنجووق** / sincûq/: ناو. شتانێ؛ داردەستی سەردادراو کە منال لە کایەدا دەیچەقێنن ☰ چوبی کە کودکان در بازی در زمین فرو می‌کنند

**سنجووقێن** / sincûqên/: ناو. کایەی سنجووق ☰ از بازی‌های کودکان

**سنجووەتاڵە** / sincûwetałe/: ☜ **سرینچکەتاڵە**

**سنجە** / since/: ☜ **سرینچك**

**سنجەق** / sinceq/: ناو. ۱. ☜ **سنجاخ** ۲. ناوچە؛ مەڵبەندێکی بچووک ☰ ۱. ☜ **سنجاخ** ۲. بخش؛ ناحیە

**سنجەوی** / sincewî/: ☜ **سرینچك**

**سنجەی** / sincey/: ناو. ۱. ☜ **سرینچك** ۲. عەنناب؛ بەرێکە لە سنجوو دەکا ☰ ۱. ☜ **سرینچك** ۲. عنّاب

**سنجی** / sincî/: ناو. ۱. ☜ **سرینچك** ۲. بەری دارێکە تامی ترشە ☰ ۱. ☜ **سرینچك** ۲. ثمر ترش مزەی درختی است

**سنجید** / sincîd/: ☜ **سرینچك**

**سنجێری** / sincêrî/: ناو. جۆرێ ترێ کە بۆ دۆشاو پەسندە ☰ نوعی انگور

**سنخچی** / sinxçî/: ناو. جەڕڕاح؛ ئێسک‌گرەوە؛ شکستەبەند ☰ شکستەبند

**سندان**[1] / sindan/: ناو. سنان سنگان؛ سننان: ١. سانجن؛ سنجان؛ نەخۆشییەکی یەکسمکوژە ٢. سندیان؛ دەزگا؛ ئامرازی شت لە سەر کوتانی پینەچی و ئاسنگەر ≡ ١. نوعی بیماری کشندەی ستور ٢. سندان پینەدوزان و آهنگران

**سندان**[2]: سارستە. سنان؛ سننان؛ سنگان؛ زەهری هەلایل؛ قوزلقورت؛ ژەقنە؛ جوێنێکە ≡ نفرینی است

**سنداناوی** / sindanawî/: ناوەلناو. نەخۆش بە دەردی سندان ≡ مُبتلا به بیماری «سندان»

**سندانک** / sindanik/: ناو. بستووگە؛ کووپەلە؛ کووپەی چکۆلە ≡ بستو؛ خُم کوچک

**سندرووک** / sind(i)rûyk/: ناو. سندریک؛ دارەتەرم؛ دارەمەیت؛ تاوت؛ داربەستی مردوو گوازتنەوە ≡ تابوت

**سندریک** / sind(i)rîk/: ☜ سندرووك

**سندک** / sindik/: ☜ سمیتك-١

**سندم** / sindim/: ناو. ١. پاوەن؛ پاوانە؛ ئەشکێل؛ پێوەندی ئاسن ‹ئەم سندمە گلینە بشکێنە تا بزانی/ رەمکێشی گش مەلانی و لە تەشقی عاسمانی «هەژار، *چوار ناملیکه*»› ٢. قوفلەگرێ ≡ ١. شکال؛ پایبند ٢. گره

**سندۆقجام** / sindoqcam/: ناو. وەنەدی؛ قاپئاوێنە؛ جابەی لە شیشە ≡ جعبەی شیشەای

**سندۆڵ** / sindoł/: ناو. دەفری دارین یان بەردین بۆ چەلتووک و ساوار کوتان ≡ ظرف چوبی یا سنگی برای کوبیدن شالی و گندم

**سندووریک** / sindûrîk/: ناو. تابووت؛ دارەمەیت ≡ تابوت

**سندووق** / sindûq/: ناو. سنۆق؛ سنووق: ١. چەکمەزە؛ مەساە؛ مەساهە؛ مەحفەرە؛ خەزنە؛ جەعبەیەکی دەرگادار بۆ هەلگرتنی شت یان پووڵ ‹سندووقی کەلپەل؛ سندووقی پارە› ٢. قەوان؛ قەوانە؛ گرامافون ≡ ١. صندوق ٢. گرامافون

▣ **سندووقی سەر**: *[سەرزارەکی]* بەلاگەردان؛ بەلاگێر؛ قەزاگر ‹ترساوم لە ئەو لوولە دەمانچەی سەری رانت/ بمبەخشە بە سندووقی سەری خۆت و کورانت «قانع»› ≡ بلاگردان

**سندە** / sinde/: ☜ سمتە

**سندەرەمڵ** / sindeřemił/: ناو. تەمووخ؛ رەملی لێکهالاو ≡ ماسەی کلوخ شدە

**سندەگل** / sindegil/: ناو. کەملتە؛ کەستەک؛ کلۆی گل ≡ کلوخ

**سندەگڵ** / sindegił/: ☜ سمتەگڵ

**سندی** / sindî/: ناو. دارابی؛ دارێکە لە تیرەی نارنج بە میوەی مێخۆش و زەردەوە ≡ دارابی

**سندیان** / sind(i)yan/: ☜ سندان[1]-٢

**سنسل** / sinsil/: ناو. مۆغەرەی پشت ≡ ستون فقرات

**سنعات** / sin'at/: ناو. پیشە؛ پیشەسازی ≡ صنعت

**سنعاتکار** / sin'atkar/: ناو. پیشەساز ≡ صنعتگر

**سنف** / sinf/: ناو. دەستە؛ کۆمەلێ لە ئەندامانی هاوپیشە ≡ صنف

**سنک** / sink/: ناو. ساجوور؛ ساژور؛ سانجۆل؛ سانجی؛ سەمەندۆک؛ کەلەن؛ کالان؛ قەلادە؛ مەرەس؛ قرێتە؛ زنجیر، زوێڵ یان گەوی کانزایی پتەو کە لە ملی سەگ و راوری دەکەن ≡ قلادە

**سنکۆلک** / sinkolik/: ناو. قولێنگ؛ قولنگە ≡ کلنگ

**سنگ** / sing/: ناو. ١. سینگ؛ سینە؛ لە زگ بەرەژوور تا پێسیر ٢. بزماری ئەستوور لە دار یان ئاسن ٣. میلی پۆشەن چنین ٤. دەرزی زەلامی جەوال دروون ٥. نەخۆشی کرم لە زگدا ≡ ١. سینە ٢. میخ کلفت ٣. میل بافتنی ۴. جوالدوز ۵. بیماری انگل در شکم

▣ **سنگ شێری پشت ماکەر**: *[مەجاز]* زلی بێهونەر؛

پیاوی زەبەلاح و کەمغیرت ☚ آدم لندهور بی‌غیرت

▣ **سنگ داقوتان:** ☜ **سنگ داکوتان**

**سنگ داکوتان:** سنگ داقوتان: ۱. گوڵمێخی زل لە زەوی کوتان ۲. *[کینایە]* نەڕۆیشتنی میوانی خوێنتاڵ ☚ ۱. میخ کلفت کوبیدن ۲. کنگر خوردن و لنگر انداختن

**سنگ دان:** زگ دانی دیوار ☚ شکم دادن دیوار

**سنگ دانە پێش:** ☜ **سنگ دانە پێشەوە**

**سنگ دانە پێشەوە:** سنگ دانە پێش: ۱. داوخواز بوون (زۆرتر بۆ کاری گران) ۲. خۆ نواندن؛ خۆ تێ هەڵقوتاندن ☚ ۱. داوطلب شدن ۲. خودنمایی کردن

**سنگ قوتان:** ☜ **سنگ** کوتان

**سنگ کوتان:** سنگ قوتان: ۱. بزماری زل داکوتان ۲. بە لەپی دەست لە سنگ دان ☚ ۱. میخ درشت کوبیدن ۲. سینە زدن

**سنگ لێ کوتان:** *[کینایە]* تووک لێ کردن ☚ کسی را نفرین کردن

**سنگ هەڵکێشان:** خۆ شاندان و تاریفی خۆ کردن ☚ خودستایی کردن

**خوشاردنە سنگەوە:** گرتنە ئامێزەوە؛ بە سینەوە لکاندن ☚ تنگ در آغوش گرفتن

**سنگان / singan/:** ناو. ۱. ☜ **سندان ـ۱و۲** ۲. جۆرێ نەخۆشی لە سەرماوە تووشی مرۆ دەبێ ۳. بەڵایەکە تووشی بێستان دێ ☚ ۱. ☜ **سندان ـ۱و۲** ۲. سرمازدگی ۳. از آفات پالیز

**سنگاناوی / singanawî/:** ☜ **سنگان‌لێدراو**

**سنگان‌لێدراو / singanlêd(i)raw/:** ناو. سنگاناوی؛ میوەی بێستانی تووشی سنگان بوو ☚ میوەی پالیز «سنگان» زدە

**سنگبەخەنە / singbexene/:** ناو. بەرسۆلینگ ☚ پرندەای است

**سنگزەردە / singzerde/:** ناو. سینگەزەردە؛ مەلێکی پچووکی سنگ و بەرۆک زەردە ☚ پرندەای کوچک سینەزرد

**سنگک / singik/:** ☜ **سنگەك**

**سنگۆ / singo/:** ناو. ڕمب؛ ڕم؛ سونگی ☚ نیزە

**سنگە / singe/:** ناو. دەرپەڕیوی؛ زۆپی؛ قوتی ☚ برآمدگی

**سنگەباز / singebaz/:** ناو. سنگەوباز؛ سنگەوبازد؛ سینگەباز؛ سینگەوباز؛ سینەباز؛ باز بە هەنگاوی بەرز ☚ پرش بلند

**سنگەبەر / singeber/:** ئاوەڵناو. نەجووڵ؛ نەجم؛ سنگ لێ داکوتراو ☚ میخکوب

**سنگەپێ / singepê/:** ئاوەڵناو. چەق؛ نەبزوو ☚ ثابت؛ غیرمتحرک

**سنگەچەڵەمە / singeçełeme/:** ناو. دەفەی سنگ؛ پانایی سنگ ☚ پهنای سینە

**سنگەسنگ / singesing/:** ناو. ۱. سرمەسرم؛ هەرا و چەقە ۲. سنگەسنگە؛ خاوەخاو. هەروەها: **سنگەسنگ کردن** ☚ ۱. جنجال و هیاهو ۲. اهمال و سستی در کار

**سنگەسنگە / singesinge/:** ☜ **سنگەسنگـ۲**

**سنگەسۆژە / singesoje/:** ناو. ژان و کزانەوەی سینگ ☚ سوزش سینە

**سنگەک / singek/:** ناو. سنگک؛ زیپرک؛ عازەوی؛ زیپکەی ڕوخساری تازەلاوان ☚ عزبی؛ جوش جوانی

**سنگەکەر / singeker/:** ناو. ئاریخ؛ ئاخیە ☚ میخ‌طویلە

**سنگەڵ / singeł/:** ناو. تەپک؛ گردوولکە؛ شوێنێ بە قەد کێوەوە کە شین بێ و گیای پێوە بمێنێ ☚ تپەی کوچک و سرسبز

**سنگەوباز / singe w baz/:** ☜ **سنگەباز**

**سنگەوبازد / singe w bazd/:** ☜ **سنگەباز**

**سنگ‌هەڵکێش** /singhełkêş/: ئاوەڵناو. خۆنیشاندەری تاریف‌خۆکەر ☰ خودستای لافزن

**سنله** / sinle/: ☜ **سل١ـ١**

**سنّنان** / sinnan/: ☜ **سندان‌ـ١و٢**

**سنۆبەر** / s(i)nober/: ناو. سنەوبەر؛ نەوژ؛ نەوز؛ ناژین؛ ناز؛ ناژ؛ ناژوو؛ ناجوو؛ ناوی چەند جۆر داری هەمیشە سەوزی سەردەسێرە بە گەشەی خێراوە کە چێوەکەی لە پیشەسازیدا کەڵکی زۆرە ☰ درخت صنوبر

**سنۆتە** / s(i)note/: ئاوەڵناو. سنۆرتە: ١. زۆڵ؛ بیژوو؛ حەرامزادە ٢. چەورە و بێکارە ☰ ١. حرامزاده ٢. لات

**سنۆرتە** / s(i)norte/: ☜ **سنۆتە**

**سنۆق** / s(i)noq/: ☜ **سندووق**

**سنۆق‌ئاوازە** / s(i)noq'awaze/: ناو. گرامافۆن ☰ گرامافون

**سنۆک** / s(i)nok/: ناو. دەمبێنی سەر قەپۆزی سەگ و حەیوانی دڕ کە بەر بە قەپ گرتن و خواردنیان دەگرێ ☰ پوزەبند

⊡ **سنۆک کردن**: بە دەمبێن دەمی سەگ و حەیوانی دڕ بەستن ☰ پوزەبند زدن

**سنو** / s(i)nû/: ناو. ١. دەردی ڕۆخلەکۆرە ٢. کات و دۆخی بالغ بوونی سەگ کە پاش ساڵە وەختێکە ☰ ١. بیماری آپاندیسیت ٢. بلوغ سگ

**سنور** / s(i)nûr/: ناو. سینۆر؛ کەوشەن؛ حەد؛ هەد؛ حدوود؛ دەروەچار؛ سەرحەد؛ مەرز؛ توخوب؛ تخوب؛ تخووب؛ توخیب؛ تغووب؛ تخوم؛ تخووم؛ کەرخ؛ تالخ؛ پەڕ؛ سەرخەت؛ هۆم؛ گڤاندە؛ نومهەد؛ سەرینگا: ١. جەسپەر؛ شوورە؛ بەنک؛ بەلک؛ چیلە؛ درسەگ؛ قەمتەرە؛ تیزماڵکەزەوین یان لەمپەری سروشتی (وەک کەژ و چەم) کە پانتای ژێردەسەڵاتی دوو وڵاتی هاوسێ دیاری دەکا ‹سنووری ئێران و عێراق› ٢. ناوچەی پەنا سنوور ‹ماوەیێ لە سنووردا دەژیا› ٣. بڕ؛ ناوەرە؛ ناو؛ سەراوەرد؛ بەشی دەرەکی یا قەراخی ئاقارێ ‹سنووری لەوەڕگە› ٤. ئەوەی ڕادە یان بەری شتێ دەسنیشان دەکا ‹جەماوەری زەوی لە سنووری حەوت ملیارد تێپەڕی کرد› ٥. *[ئەدەبی]* هەرێم؛ وڵات؛ ئاقار؛ ناوان ‹سنووری زانست› ☰ ١تا٥. مرز

⊡ **سنور پەڕاندن**: *[کینایە]* کاری نائاسایی کردن ☰ کار غیرمعمول کردن

**سنور دانان**: کەوشەن دیاری کردن ☰ تعیین حدود کردن

**سنورچە** / s(i)nûrçe/: ناو. لکی تازە لە دار دەرچووگ ☰ جوانەی تازە

**سنوردار** / s(i)nûrdar/: ئاوەڵناو. ڕادەدار؛ بە کەوشەنی دیاریکراوەوە ☰ محدود

**سنورەوان** / s(i)nûrewan/: ناو. مەرزەوان؛ کەسێ کە کێشکی سنوور دەکێشێ ☰ مرزبان

**سنوق** / s(i)nûq/: ☜ **سندووق**

**سنە** / s(i)ne/: ناو. ١. ☜ **سمتە** ٢. سلی؛ ڕەوەکی ☰ ١. ☜ **سمتە** ٢. رَم

**سنەسن١** / s(i)nesin/: ناو. ساوەساو؛ خاوەخاو؛ تەمبەڵی و دەستەوستانی لە کاردا ‹بە بەر ئەو کارەوە هەر سنەسنیەتی› ☰ شُل‌بازی؛ سستی و کاهلی

**سنەسن٢**: ئاوەڵکار. ساوەساو؛ خنەخن؛ هێواش و لەسەرخۆ ‹هەر سنەسن نازانم چ دەکا› ☰ کاهلانە؛ بە کُندی

**سنەوبەر** / s(i)newber/: ☜ **سنۆبەر**

**سنەی** / s(i)ney/: ناو. جۆرێ ترێ کە زوو پێ‌دەگا ☰ نوعی انگور زودرس

**سنیاگ** / sinyag/: ئاوەڵناو. سەنیاگ: ١. سەنراو؛ کڕدراو ٢. ئەستێندراو ☰ ١. خریده شده ٢. گرفته شده

**سنیان / sinyan/**: چاوگ. سەنران؛ کڕدران ☰ خریداری شدن

**سنیای / sinyay/**: چاوگ. سەنران ☰ خریداری شدن

**سنێ / s(i)nê/**: ناو. داریێ لە لا مل و کەلەکەی ئاژەڵی دەبەستن تا دەمی نەگاتە برینی خۆی ☰ چوبی که بر گردن و کفل حیوان می‌بندند تا زخم خود را ناسور نکند

**سنێتر / s(i)nêtir/**: ☜ سنت

**سنێر / s(i)nêr/**: ناو. ڕیخ؛ شیاکە؛ سەرین؛ سەنێر؛ سەوقر؛ سەورۆ؛ سۆن؛ لاس؛ تەرس؛ لاز؛ لاسک؛ ترۆل؛ تەردە؛ جەللە؛ چۆسلە؛ چەمین؛ گووی چارویێان ☰ سرگین

**سنێرگە / s(i)nêrge/**: ناو. سەرانگوێلک؛ گووفک؛ سەرەنوێلک؛ جێگەی ڕژاندنی شیاکە و پەین ☰ سرگینگاه

**سنێژە / s(i)nêje/**: ناو. ئامرازێکی دەزگای جۆلایی ☰ از ابزار بافندگی

**سوا[1] / s(i)wa/**: ناو. ۱. سۆزی؛ سبەی؛ ڕۆژێ کە دادێ ۲. وەستا؛ ئوسا؛ وەسا ☰ ۱. فردا ۲. اُستادکار

**سوا[2]**: ئاوەڵکار. سۆزی؛ سبەی؛ لە ڕۆژی دواییدا ☰ فردا

**سواب / s(i)wab/**: ناو. سواو؛ پاداشی چاکە لە خوداوە ☰ ثواب

**سواپ / s(i)wap/**: ☜ ساپ-۲

**سواپێن / s(i)wapên/**: ناو. زاپان؛ لاپارێن، زاپێن؛ گەمە بە زاپ ☰ بازی با شن

**سواخ / s(i)wax/**: ناو. سواغ؛ سیواخ؛ سیواغ؛ سیواق؛ کاری پێداماڵین (زۆرتر بۆ قوڕ) ☰ اندودکاری

⊡ **سواخ دان**: سواخ کێشان؛ ساوین/ ماڵین بە دیوار و خانوودا (قوڕ و گێچ و ...) ☰ اندودن

**سواخ کێشان**: ☜ **سواخ دان**

**سواخدراو / s(i)waxd(i)raw/**: ئاوەڵناو. پێداماڵراو ☰ اندوده شده

**سوادە / s(i)wade/**: ناو. سەوادە؛ سەڵتەزەلام ☰ پیادەی تنها

**سوار[1] / s(i)war/**: ناو. سویار؛ سیار: ۱. کەسێ کە لە سەر پشتی ئەسپ و ... دەڕوا ‹سوار تا نەگلێ نابێ بە سوار «مەسەل»› ۲. منالێ کە قاچی لە پێش سەریدا دێتە دنیاوە ۳. مونتاج؛ کاری پێکەوە نانی بەشگەلی دەزگایەک ☰ ۱. سوار ۲. نوزادی که از پا به دنیا آید ۳. نصب؛ مونتاژ

⊡ **سواری سەر/ مل/ کۆڵی کەسێک بون**: *[مەجاز]* بە سەر کەسێکدا زاڵ بوون ‹وا سواری سەری بووە، جووڵە ناکا!› ☰ بر کسی مسلط شدن

**سوار[2]**: ئاوەڵناو. سویار؛ سیار: ۱. نیشتوو؛ لە سەر یان نێو کەرەستەیەکی ڕاگواستن ۲. زاڵ؛ باوخۆش ۳. بلندتر؛ بەرزتر ٤. پێکەوە لکاو و دامەزراو ☰ ۱. سوار ۲. چیره ۳. مُشرِف ۴. مونتاژ شده

⊡ **سوار بون**: ۱. وەنشتا؛ وەنشتش؛ خۆ هاویشتنە سەر پشتی حەیوان یان هەرچی ۲. چوونە ناو کەرەستەی ڕاگواستن ‹خێرا کە سوار بە! پاسەکە دەڕوا› ۳. *[مەجاز]* لە بەرزایدا بوون؛ زاڵ بوون ‹کەوێلەکە سوارە بە سەر هەموو دەشتەکانی ئەو ناوچەیەدا› ٤. *[مەجاز]* ڕەوان و ئاهەنگین بوون (شیعر و هۆنراوە) ‹ئەسپی ڕەش بەیتی تا بلەی چاکە/ نەزمیشی یەکجار سوار و چالاکە «حاجی قادر»› ☰ ۱و۲. سوار شدن ۳. مسلط بودن ۴. روان بودن (شعر)

**سوار کردن**: ۱. سەر خستن؛ خستنە سەر یان نێو کەرەستەیەکی ڕاگواستن ‹چەند لاویان سواری ماشینەکە کرد و بردنیان› ۲. پێکەوە نان؛ خستنە سەر یەک ☰ ۱. سوار کردن ۲. مونتاژ کردن

**سواری قسەی خۆ بوون:** *[مەجاز]* پێداگرتن و پێچەقاندن لە سەر قسە و بیر و ڕای خۆ ☰ بر نظر خود پافشاری کردن

**ـ سوار**[٢]: پاشەوشە. سوبار؛ لە سەر ‹شۆڕەسوار؛ کەرسوار› ☰ ـ سوار

**سوارچاک / s(i)warçak/**: ناوەلناو. سوارخاس؛ کارامە لە ئەسپسواریدا ☰ سوارکار

**سوارخاس / s(i)warxas/**: ☜ **سوارچاک**

**سوارخە / s(i)warxe/**: ناو. لق؛ چیلکە ☰ شاخە

**سوارۆ / s(i)waro/**: ناو. هەوای گۆرانییەکی کوردی ‹بە سوارۆییک بە حەیرانێک، دامرکێنە بلێسەی دەرد «سوارە»› ☰ از آهنگ‌های موسیقی کُردی

**سوارۆک / s(i)warok/**: ناو. بادروو؛ تاجخرووس؛ پۆپەکەڵەشێر ☰ تاج‌خروس

**سوارە / s(i)ware/**: ناو. ١. سوار؛ سواری ئەسپ ٢. دەستەی سواران ☰ ١. سوار ٢. تیپ سوارە

▣ **سوارەی بادەران:** چەکداری سوار؛ بەشێ لە سوپا کە لە سەر ئەسپەوە دەچوونە شەڕ ☰ سوارەنظام

**سوارەی شەترەنج:** شەش جۆرەداشی شەترەنج بریتی لە شا، وەزیر، ڕوخ، فیل، ئەسپ و پیادە ☰ مُهرەی شطرنج

**سوارە و پیادە / s(i)ware w p(i)yade/**: ناو. جۆرێک ئۆیەی بە زەنگیانە گیراوە، بۆ جوانی لە پەراوێزی دەسماڵی دەگرن ☰ نوعی زیور زنانە

**سواری**[١] **/ s(i)warî/**: ناو. سوباری؛ سیاری: ١. کاری سوار بوون لە سەر شتێک و هاتوچۆ پێ کردنی ‹سواری چاکمان کرد› ٢. بار و چۆنیەتی سوار بوون ‹ئەم ماشینە سواری خۆشە› ☰ ١و٢. سواری

▣ **سواری پێ دان:** *[کینایە]* کۆڵ دان؛ فەرمانبەری کردن ‹ئەگەر سوارییان پێ بدەی، فێرت دەبن› ☰ سواری دادن

**سواری**[٢]: ناوەلناو. سویاری؛ سیاری؛ لەبار بۆ سوار بوون ‹ئەسپی سواری؛ ماشینی سواری›. بەرانبەر: **باری** ☰ سواری

**ـ سواری**[٢]: پاشەوشە. کاری سوار بوون ‹ئەسپسواری› ☰ ـ سواری

**سواژ / s(i)waj/**: ناو. سواش؛ جەنگ؛ شەڕ و هەرا ☰ جنگ و ستیز

**ـ سواژی / s(i)wajî-/**: پاشەوشە. ـ سواشی؛ ـ بەلشی؛ دژایەتی و بەرەنگاری لەگەڵ شتێک ‹دینسواژی› ☰ ـ ستیزی

**سواش / s(i)waş/**: ☜ **سواژ**

**سواغ / s(i)wağ/**: ☜ **سواخ**

**سواڤ / s(i)wav/**: ناو. ١. بەربەرۆچک؛ بەرۆژ؛ **ڕووەو ڕۆژ** ٢. تاڤگە؛ ئاوهەڵدێر ☰ ١. آفتابگیر ٢. آبشار

**سواق / s(i)waq/**: ناو. دەلک؛ سواغ ☰ عمل اندودن

**سواکین / s(i)wakîn/**: ناو. بەننا؛ گلکار ☰ بنّا

**سواڵ / s(i)waɫ/**: ناو. سواڵی؛ پارسە؛ دەرۆزە ☰ گدایی

▣ **سواڵ کردن:** پارسە کردن؛ سواڵی کردن؛ دەرۆزە کردن ☰ گدایی کردن

**سواڵک / s(i)waɫik/**: ناو. ١. ☜ **سواڵەت** ٢. دەفری خۆراکی سەگ ☰ ١. ☜ **سواڵەت** ٢. ظرف خوراک سگ

**سواڵکەر**[١] **/ s(i)waɫker/**: ناو. دەرۆزەکەر؛ خواسکەر؛ خوازەلۆک؛ خوازۆک؛ خازۆک؛ خازخازۆک؛ خوازەکار؛ خواستۆخ؛ خۆهەستەگ؛ پارسەک؛ پارساک؛ چاسر؛ چەکەوچن؛ تاسووکەر؛ گەدا؛ گدا؛ کەمەسا؛ گیایکەر؛ لەتەچین؛ لەتەچن؛ چنک ـ چنک؛ دەرکۆ ـ دەرکۆ؛ ئەوەی بۆ بەڕێوە چوونی ژیانی، چاوی لە دەستی ئەم و ئەوە ☰ گدا

**سواڵکەر**[٢]: ناوەلناو. *[پلار]* گەدا: ١. هەژار؛ نەدار

‹قاتی پیاو بوو مێردت بەم سوالکەرە کرد؟› ٢. *[مەجاز]* دەستقووچاو؛ خوازەلۆک ⇆ ١. گداگشنە ٢. گداصفت

**سواڵکەرانە / s(i)wałkerane/:** ئاوەڵناو. *[پلار]* وەک سوالکەران ‹ژیانی سوالکەرانە› ⇆ گدایانە

**سواڵکەری / s(i)wałkerî/:** ناو. گەدایی؛ لەتەچینی؛ جوەدەری: ١. دەرۆزەیی؛ پارسەکی ٢. *[پلار]* چۆنیەتی چاو لە دەستی ئەم و ئەو بوون ⇆ ١و٢. گدایی

**سواڵە / s(i)wałe/:** ناو. سڤالە؛ سەوالە؛ لەپێک لە دروێنە ⇆ مُشتی از درویده

**سواڵەت / s(i)wałet/:** ناو. سوالک؛ پارچەی شکاوی دەفری گلێنە (دیزە و گۆزە و ...) ⇆ قطعه سُفال

**سواڵەشێونیکە / s(i)wałeşêwnîke/:** ناو. فشە؛ گیایەکە لە نێو گەنمدا شین دەبێ و کاتی دروێنە ناهێڵێ سوالەکە پێکەوە بنووسێ و بلاو دەبێتەوە ⇆ گیاهی است

**سواڵەشێوێنکە / s(i)wałeşêwênke/:** ناو. فشە؛ بژارێکە لە نێو گەنمدا شین دەبێ و کاتی دروێنە نایەڵێ سوالەی دەستی دروێنەوان پێکەوە بنووسێ و فشی دەکاتەوە ⇆ گیاهی است

**سواڵەگر / s(i)wałegir/:** ☜ **سواڵەهۆن**

**سواڵەهۆن / s(i)wałehon/:** ناو. سوالەگر؛ دروێنەوان ‹پالەی سوالەهۆنی بەگورد/ چەقلی چاوی دژمنی کورد «هێمن»› ⇆ دروگر

**سواڵی / s(i)wałî/:** ☜ **سواڵ**

**سوان[1] / s(i)wan/:** چاوگ. تێنەپەر. //سوای؛ دەسوێی؛ بسوێ// ساویان؛ سوویان؛ ساویای؛ سویای؛ لووس بوون بە هۆی لێک خشانەوە ⇆ سائیده شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: سواو/ چاوگی نەرێنی: نەسوان

**سوان[2]:** ناو. برِبەند؛ برِوەن؛ هەسان ⇆ سوهان

**سواندان / s(i)wandan/:** ☜ **سوانە**

**سواندن / s(i)wandin/:** ☜ **ساوین**

**سواندنەوە / s(i)wand(i)newe/:** چاوگ. زۆر ساوینەوە ⇆ سودن

**سواندولکە / s(i)wandulke/:** ☜ **ساندیلکە**

**سواندۆکە / s(i)wandoke/:** ☜ **ساندیلکە**

**سواندووکە / s(i)wandûke/:** ☜ **ساندیلکە**

**سواندوولکە / s(i)wandûlke/:** ناو. چۆلەکە؛ چوچک ⇆ گنجشک

**سواندە / s(i)wande/:** ☜ **سوانە**

**سواندیلکە / s(i)wandîlke/:** ☜ **ساندیلکە**

**سوانن / s(i)wanin/:** ☜ **ساوین**

**سوانە / s(i)wane/:** ناو.ساندە؛ سواندە؛ سڤاندە؛ سباندە؛ سوێبانە؛ سواندان؛ سێڤاندە؛ سەلەندە؛ پاسارە؛ گوێسوانە ⇆ کنارەی بام

**سوانەوە / s(i)wanewe/:** ☜ **ساوین**

**سواو[1] / s(i)waw/:** ☜ **سواب**

**سواو[2]:** ئاوەڵناو. ساویاگ؛ ساویاو؛ سیویاگ؛ سایسە؛ قەسپ ⇆ سائیده

**سواوی / s(i)wawî/:** ناو. شوێنەواری سوان ⇆ سائیدگی

**سوب[1] / sub/:** ناو. ١. سبح؛ بەرەبەیان ٢. سۆزی؛ سبەی ⇆ ١. بامداد ٢. فردا

**سوب[2]:** ئاوەڵکار. ١. بەیانی؛ سۆزی ٢. لە کاتی بەیانیدا ‹بازەش هەناسەم سوب وەنەش دەرۆ/ یەخ کەرۆ قەتار ئاسان بویەرۆ «مەولەوی»› ⇆ ١. فردا ٢. صُبح

**سوبا / suba/:** ناو. بەیانی؛ سۆزی؛ رۆژێ دادێ ⇆ فردا

**سوبات / subat/:** ئاوەڵناو. سەڵت؛ بێ هاوسەر و ماڵ ⇆ مُجرد

**سوبحانەڵڵا / subĥanełła/:** سارستە. ١. خوا لە کەم و کووڕی پاک و پوارە ٢. تەح؛ پەکوو؛ وشەیەک

بۆ ده‌ربڕینی سه‌ر سووڕمان ■ ١. سبحان الله ٢. عَجَب

**سوبسه‌حه‌ر** / subseĥer/: ئاوه‌ڵکار. به‌ره‌به‌یان؛ به‌یانی زوو ■ بامدادان

**سوبه**[1] / sube/: ناو. سوبیانێ؛ سۆزی؛ سوبێ؛ به‌یانی؛ ڕۆژێ دادێ ■ فردا

**سوبه**[2]: ئاوه‌ڵکار. سوبیانێ؛ سۆزی؛ سوبێ؛ له‌ به‌یانیدا ■ فردا

**سوبه‌زوو** / subezû/: ناو. سۆزی به‌یانی؛ ده‌سپێکی ڕۆژێ که‌ دادێ ■ فردا پگاه

**سوبیانێ** / subyanê/: ☜ **سوبه**

**سوبێ** / subê/: ☜ **سوبه**

**سوپ** / sup/: ناو. سۆپ؛ ڕیزه‌به‌ردی ناو چۆم که‌ داری ده‌خه‌نه‌ سه‌ر بۆ ڕاوه‌ماسی ■ سنگریزه‌های رودخانه که برای صید ماهی چوب بر آن گذارند

**سوپا** / supa/: ☜ **سپا**

**سوپاخانه** / supaxane/: ☜ **سپاخانه**

**سوپاڕان** / supařan/: ناو. سه‌رکرده‌ی سپا ■ سپهسالار

**سوپاس** / supas/: ☜ **سپاس**

**سوپاسالار** / supasalar/: ☜ **سپاسالار**

**سوپاسگوزار** / supasguzar/: ئاوه‌ڵناو. منه‌تبار؛ مه‌منوون ■ مدیون

**سوپه‌ر** / super/: ☜ **سپێر-٢**

**سوپێر** / supêr/: ☜ **سپێر-٢**

**سوپێل** / supêl/: ناو. تاڤگه‌؛ ئاوهه‌ڵدێر ■ آبشار

**سوترنج** / sutrinc/: ☜ **شه‌تره‌نج**

**سوتفه** / sutfe/: ئاوه‌ڵناو/ ئاوه‌ڵکار. ده‌گمه‌ن؛ ده‌گمه‌؛ نایاب؛ که‌موێنه ■ نادر

**سوتلی** / sutlî/: ناو. *[ناشیرین]* قه‌پاتمه‌؛ ژنی بێ‌ماره‌یی ڕاگرتن بۆ ده‌گه‌ڵ ڕابواردن ■ مترس؛ نگهداری زن بدون نکاح برای خوشگذرانی

**سوتو** / sutû/: ☜ **سوتك**

**سوجاده** / sucade/: ناو. ڕایه‌خێکی ته‌نراوی به‌ نه‌قش‌و نیگاره‌، زۆرتر به‌ ئه‌ندازه‌ی به‌رماڵێک ■ نوعی گلیم نقشدار

**سوججه** / succe/: ☜ **سجه**

**سوجه** / suce/: ☜ **سجه**

**سوجه‌مار** / sucemar/: ناو. ماری سوور ■ سرخ مار

**سوچ** / suç/: ☜ **سوچ -٢**

**سوچانن** / suçanin/: ☜ **سوتاندن**

**سوچیای** / suçyay/: چاوگ. سووتان ■ سوختن

**سوح** / suĥ/: ☜ **سبح**

**سوحا** / suĥa/: ناو. به‌یانی؛ سبحه‌ینێ ■ فردا

**سوحبه‌ت** / suĥbet/: ناو. ١. قسه‌؛ کاری قسه‌ کردن ‹تۆ که‌م نه‌زه‌ری ده‌رحه‌قی من ئێسته‌که‌ ئاغا/ من ماوه‌مه‌ هه‌وای سوحبه‌تی تۆم هه‌ر له‌ ده‌ماغا «شێخ ڕه‌زا»› ٢. *[مه‌جاز]* شۆخی؛ گاڵته‌ و گه‌پ ‹بێ‌سوحبه‌ت!؛ سوحبه‌ت ده‌کا!› ■ ١. صُحبت ٢. شوخی

**سوخار** / suxar/: ناو. جۆخین؛ جێ خه‌رمان ■ خرمنگاه

**سوخاڵ** / suxał/: ☜ **خه‌ڵوز**

**سوخاڵدان** / suxałdan/: ☜ **خه‌ڵوزان**

**سوخت**[1] / suxt/: ناو. سۆخت؛ سووته‌مه‌نی ■ سوخت

**سوخت**[2]: ئاوه‌ڵناو. *[کینایه]* ده‌سته‌نگ؛ ژار؛ به‌له‌نگاز ■ بینوا

⊡ **سوخت کردن:** *[کینایه]* ڕووت کردنه‌وه‌؛ هه‌موو ماڵ و دارایی لێ سه‌ندن ■ لُخت کردن

**سوخته** / suxte/: ناو. ١. تازه‌فه‌قێ؛ ده‌رس‌خوێنی سه‌ره‌تایی ٢. کرێژی سووتاوی تریاک که‌ دووباره ده‌یکێشن ■ ١. طلبه‌ی دوره‌ی مقدماتی ٢. شیره‌ی تریاک

**سوخرمه** / suxirme/: ☜ **سخورمه**

**سوخره** / suxre/: ناو. ١. سوور؛ سۆر؛ ڕه‌نگی خوێن

٢. سۆخره؛ سۆغره؛ سوغره؛ بێگار ▣ ١. سُرخ ٢. بیگاری

**سوخمه** / suxme/: ناو. ١. زوخمه؛ زەخمه؛ سخمه؛ سیخمه ٢. داریّ که وه بەر دار تریّی دەدەن ▣ ١. یلک ٢. چوب تکیەی تاک

**سوخورمه** / suxurme/: ☜ **سخورمه**

**سودیوم** / sudyum/: ناو. ناتریوم؛ توخمی کیمیاوی کانزایی، به ژمارەی ئەتومی ١١ و کێشی ئەتومی ٢٢،٩٨، به ڕەنگی زیو، نەرم و بێبەرگه که خێرا له هەوادا ئوکسیده دەبێ و له دەمایەکی خواردا دەشکێ و لەگەڵ ئاودا تێکەڵ دەبێ ▣ سُدیم؛ ناتریُم

**سور** / sur/: ناو. سروه؛ شنەبا؛ شیبا؛ بای هێدی و فێنک ▣ نسیم

**سوراحی** / surahî/: ناو. دۆلکه؛ تونگه «ئەبێ بەخشەنده مل کەچ کا له ڕاستی مووچەخۆری خۆی/ سوراحی سەر فروو دێنێ له بۆ پیاله که تێکا بۆی «پیرەمێرد»» ▣ تُنگ؛ پارچ

**سوراڤی**[1] / suravî/: ناو. ڕەنگی عەنناب ▣ رنگ عنابی

**سوراڤی**[2]: ئاوەڵناو. به ڕەنگی عەنناب ▣ سرخ عنابی

**سورب** / surb/: ☜ **سرپ**

**سوربازەڵه** / surbazeɫe/: ناو. گیایەکه له گیا دۆکلیوان ▣ گیاهی آشی

**سورباش** / surbaş/: ناو. زاوت؛ هەمەکارەی ئاغا له دێدا ▣ مُباشر ارباب

**سوربی** / surbî/: ☜ **سربی**

**سورخ** / surx/: ناو. مەرەکەفی سوور؛ ڕەنگی سوور بۆ نووسین ▣ جوهر قرمز

**سورخکاری** / surxkarî/: ناو. ١. کاری ڕەنگاندن به ڕەنگی سوور ٢. /کینایه/ کاری خۆ ڕازاندنەوه به سووراو ▣ ١. نقاشی با رنگ قرمز ٢. عمل سُرخاب زدن

**سورک** / surk/: ناو. ١. ☜ **سوریجه** ٢. مۆریانه ▣ ١. ☜ **سوریجه** ٢. موریانه

**سورکۆک** / surkok/: ئاوەڵناو. سووری موو خورمایی ▣ سرخفام موخرمایی

**سورگی** / surgî/: ناو. زمانەی گۆڵەدارینی دەرگا ▣ زبانەی قفل چوبین در

**سورم** / surm/: ناو. زەوی ڕووتەن ▣ زمین بی‌گیاه

**سورمه** / surme/: ناو. ١. کل؛ کڵ؛ کله؛ تۆزی بڕەی زیو به ڕەنگی ڕەشی ئاماڵسوور بۆ چاو یان موو ڕەش کردن. هەروەها: **سورمه کێشان** ٢. پەراوێزی به زیو چندراوی عابا ▣ ١. سُرمه ٢. حاشیەی سیمباف عبا

**سورمەدان** / surmedan/: ناو. ١. سورمەدوو؛ کلدان؛ کلتور؛ توورەکەی چکۆلەی جێگەی سورمه ٢. گۆی سەر خەنجەر ▣ ١. سُرمەدان ٢. قُبەی دستەی خنجر

**سورمەدوو** / surmedû/: ☜ **سورمەدان ـ١**

**سورمەڕێژ** / surmeřêj/: ناو. پەراوێزی زێوچنی عەبا ▣ حاشیەی سیمباف عبا

**سورمەیی**[1] / surmeyî/: ناو. ڕەنگی سورمه ▣ رنگ سُرمەای

**سورمەیی**[2]: ئاوەڵناو. کلی؛ به ڕەنگی سورمه ▣ سُرمەای رنگ

**سوروشت** / suruşt/: ☜ **سروشت**

**سوروشتی** / suruştî/: ☜ **سروشتی**

**سورەنگ** / sureng/: ☜ **سرنگ**

**سوریانی** / suryanî/: ناو. ١. هۆزێکی کەونارای سامی که له بەینچۆمان دەژیان ٢. هەرکام له کەسانی ئەو هۆزه ٣. له زاراوەکانی زمانی ئارامی، له سووریا و بەینچۆماندا قسەی پێ دەکرا ▣ ١تا٣. سُریانی

**سوریت** / surît/: ☜ **سروت**

**سوریلی** / surîlî/: ناو. سۆفەقیته؛ سۆفیلکه؛

سۆفییەقیتە؛ چوڕەپۆپنەکی ≡ چکاوک کاکلی

**سورین** / surîn/: ناو. سمت؛ لاقوون ≡ باسن

**سورێچکە** / surêçke/: ☜ **سورێتچکە**

**سورێنچک** / surênçik/: ☜ **سورێتچک**

**سورێنچکە** / surênçke/: ناو. سورێچکە؛ کراک؛ قرقراگە ≡ سُرخنای

**سوڕ**[1] / suř/: ناو. ۱. دلکێشی؛ ئاکاری دڵبەری ۲. نهێنی؛ ڕاز ۳. گزە؛ گز؛ ناڕاستی (لە کایەدا) ٤. جێگەی سەربەرەژێری خلیسک ≡ ۱. دلربایی ۲. راز ۳. جِر (در بازی) ۴. سراشیبی لیز

**سوڕ**[2]: ناو‌ەڵناو. ۱. وڕ؛ گێج ۲. بێ‌هەست ≡ ۱. گیج ۲. بی‌حس

**سوڕاڵک** / suřałik/: ناو. گیایەکە بە قەد کیفوار ≡ گیاهی است

**سوڕپەری** / suřperî/: ناو‌ەڵناو. جوان و دڵکێش و دڵڕفێن وەک فریشتە ≡ زیباروی دلربا

**سوڕڕەمێرگە** / suřřemêrge/: ☜ **سوڕسوڕە ـ۲**

**سوڕسوڕ** / suřsuř/: ناو. ۱. سفرەبڕ؛ سیسرکە چەپەڵە ۲. سوڕسوڕە؛ مەشکەدڕە ≡ ۱. سوسک خانگی ۲. جیرجیرک

**سوڕسوڕە** / suřsuře/: ناو. ۱. ☜ **سوڕسوڕ ـ۲** ۲. سوڕڕەمێرگە؛ مێرگە؛ مەلێکە لە تۆرەمەی سوڕە، نزیک ۱۷٫۵ سانتی‌میترە، پەڕ و باڵی قاوەیی ڕێ ـ ڕێیە، لە نێو پنچکی دڕکاوی و گیای بەرز و ژێر پەرژینان هێلانە ساز دەکا ۳. خولخولە؛ کەرخول ≡ ۱. ☜ **سوڕسوڕ ـ۲** ۲. زردەپرەی مزرعە ۳. فرفرە

**سوڕنا** / suřna/: ☜ **سرنا**

**سوڕناتک** / suřnatik/: ☜ **زوڕناتک**

**سوڕناژەن** / suřnajen/: ☜ **سرناژەن**

**سوزمە** / suzme/: ناو. پلاوپالا؛ پلاوپالێو؛ پالوێنە ≡ صافی

**سوژدە** / sujde/: ناو. *[ئیسلام]* لە بنەماکانی نوێژ کە بریتییە لە نانەسەر زەوینی حەوت ئەندام (تەوێڵ، دوو لەپی دەست، دوو ئەژنۆ، دوو پەنجەی پێ) و خوێندنەوەی ڕستەی «سُبحانَ رَبّی الاعلی و بحَمدِهِ» ≡ سجدە

⊡ **سوژدە بردن:** هەنی نانە سەر زەوی بۆ نیشاندانی ڕێز و خاکەساری ‹نالی کە شیعر ئەخوێنێتەوە/ لەگەڵیا ئەچەمێتەوە/ وەکوو سوژدە بۆ زمانی کوردی بەرێ، وایە «شێرکۆ»› ≡ سجدە کردن

**سوستەم** / sustem/: ناو. جۆرێ تفەنگی قەدیم ≡ از تفنگ‌های قدیمی

**سوسرک** / susirk/: ناو. کلۆ؛ کولە؛ کوللە ≡ ملخ

**سوعووتی** / su'ûtî/: ناو. سعووتی؛ بڕنووتی ≡ انفیە

**سوعوود** / su'ûd/: ناو. شانس؛ بەخت ≡ بخت

**سوغدوو** / suğdû/: ناو. گیپەی ئاخنراو لە برنج و قیمە و... ≡ سیرابی آکندە از برنج و گوشت و ...

**سوغدی** / suğdî/: ناو. لقێک لە زمانگەلی هێندوو ـ ئێرانی، کە لە کۆندا لە ئاسیای ناوەندی (سوغد) قسەی پێ دەکرا ≡ سُغدی

**سوغرە** / suğ(i)re/: ☜ **سوخرە ـ۲**

**سوقان** / suqan/: ناو. ئێسک؛ پێشە ≡ استخوان

**سوکر** / sukr/: ناو. پێسیر؛ مل؛ گەردن ≡ گریبان؛ گردن

**سوکرە** / sukre/: ناو. دیزە؛ مەنجەڵی لە گڵی سوورەوەکراو ≡ دیزی؛ دیگ گلی

**سوکنا** / sukna/: ناو. سوکنایی؛ ئۆقرە ≡ آرامش

**سوکنایی** / suknayî/: ☜ **سوکنا**

⊡ **سوکنایی (دڵ) هاتن:** کوڵ و کەسەر دامرکان؛ هێور بوونەوە ≡ تسکین یافتن

**سول** / sul/: ناو. پێنجەمین نۆتی مووسیقا ≡ سُل

**سولاڤ** / sulav/: ☜ **سولاڤ**

**سولتان** / sultan/: ناو. زاخە؛ کوول؛ کویل ≡ زاغە

**سول‌وسات** / sul û sat/: ناو. ۱. سووروسات ۲. حەشامات و ئاپۆرە ≡ ۱. سیورسات ۲. جمعیت زیاد

**سوله** / sule/: ناو. ١. سنگی داوێنی ڕەشماڵ ٢. بەڵمی هەرزن و چەڵتووک 🇮🇷 ١. میخ چوبی پای چادر ٢. کاهِ ارزن و شالی

**سولەم** / sulem/: ☜ سلەم

**سولەیمانک دونوکول** / suleymanikdunukul/: ناو. سولەیمانی دونوکول؛ سولەیمانێ دوونکل؛ سولەیمانۆ؛ پەپووسێمانە 🇮🇷 هُدهُد

**سولەیمانۆ** / suleymano/: ☜ سولەیمانك دونوكل

**سولەیمانی دونوکول** / suleymanîdunukul/: ☜ سولەیمانك دونوكل

**سولەیمانێ دوونکل** / suleymanêdûnkil/: ☜ سولەیمانك دونوكل

**سولی** / sulî/: ناو. سوله؛ بەڵم؛ کای هەرزن و چەڵتووک 🇮🇷 کاهِ ارزن و شالی

**سوڵ** / soł/: ☜ سڵ[٢]_١

**سوڵتان** / sułtan/: ناو. سڵتان؛ سولتان: ١. سان؛ پاتشا ٢. دۆخی ڕاست وەستانی جک؛ ئەسکوند 🇮🇷 ١. سُلطان ٢. حالت راست ایستادن شتالنگ

**سوڵگە** / sułge/: ناو. جێگەی لیز و خز 🇮🇷 جای شیب و لیز

**سوم** / sum/: ☜ سم[١]

**سوماخ** / sumax/: ☜ سماق

**سومارە** / sumare/: ناو. ڕەگەز؛ بنچینە 🇮🇷 نژاد

**سوماری** / sumarî/: ناو. کەشتی؛ گەمی؛ گەمیە 🇮🇷 کشتی

**سون** / sun/: ناو. ١. سن؛ بەڵای گەنم ٢. سنووی سەگ 🇮🇷 ١. سن آفت گندم ٢. بلوغ سگ

**سونبلەتیف** / sunb(i)letîf/: ☜ سملەتیف

**سوندروک** / sund(i)ruk/: ☜ سوندریك

**سوندریک** / sund(i)rîk/: ناو. سوندروک؛ تاوت؛ داربەست 🇮🇷 تابوت

**سونکە** / sunke/: ناو. ١. سوولکە؛ سووتکە؛ بەرماوی ورد لە سابوون یان کەشک ‹وەکوو چارۆکەکانی پوورکە خاتوون/ بە خەو نەیدی سپۆن و سونکە سابوون «قانع»› ٢. هەل؛ دەرفەت 🇮🇷 ١. تەماندەی صابون یا کشک ساییده ٢. فُرصت

**سونگە** / sunge/: ناو. سونکە؛ دەرفەت؛ هەل؛ 🇮🇷 فرصت

**سونگەر** / sunger/: ناو. هەور؛ هەوری 🇮🇷 اسفنج

**سونگی** / sungî/: ناو. سوننی؛ نێزە 🇮🇷 نیزە

▣ **سونگی تاق**: سوننی تاق؛ شەڕی سەرنێزە 🇮🇷 جنگ سرنیزە

**سوننەت** / sunnet/: ناو. *[ئیسلام]* سونەت: ١. ئاکار و کرداری پێغەمبەری ئیسلام ٢. نوێژی نە واجب ٣. *[مەجاز]* خەتەنە 🇮🇷 ١. سُنت ٢. نماز سُنت ٣. ختنە

▣ **سوننەت خوێندن**: نوێژی سوننەت خوێندن 🇮🇷 نماز سنت خواندن

**سوننەت کردن**: ١. *[مەجاز]* خەتەنە کردن ٢. *[کینایە]* تەواو خواردنی چێشتی داکراو 🇮🇷 ١. ختنە کردن ٢. کامل خوردن غذای درون ظرف

**سوننی**[١] / sunnî/: ☜ سونگی

**سوننی**[٢]: ناوەڵناو. شوێنکەوتووی یەک لە چوار مەزهەبی ئەهلی سوننەت (حەنەفی، شافیعی، مالیکی و حەنبەلی) 🇮🇷 سُنی

**سونۆگرافی** / sunog(i)rafî/: ناو. سۆنەر: ١. کار و ڕەوتی بە کار هێنانی شەپۆلی ژوورەدەنگ بۆ دیاری دانی جێی پێکهاتەگەلی نێو لەش (وەک بەردی گورچیلە یان تۆلی نێو پزدان) ٢. ڕێخراوە یان بەشێ کە ئەم کارەی تێدا دەکرێ ‹بەشی سونۆگرافی› 🇮🇷 ١و٢. سونوگرافی

**سونەت** / sunet/: ☜ سوننەت

**سووا** / suwa/: ناو. بەیانی؛ شەوەکی؛ سەبا 🇮🇷 صُبح

**سووێ** / suwê/: ناو. سی؛ سهی؛ سیپەلاک 🇮🇷 شُش

**سوۆری** / s(i)worî/: ☜ سمۆرە _١

**سوە**[١] / s(i)we/: ناو. ١. سۆزی؛ سەبەی؛ ڕۆژێ

دادێ ٢. نەمام؛ بنتا؛ چڵەڕیشەی یەکسالانی دار ٣. جۆرێ سەرپێچ و مێزەرەی ژنان ٤. *[مەجاز]* منالی ساوای خۆشەویست ☰ ١. فردا ٢. نهال ٣. نوعی دستار زنانه ۴. نوزاد عزیزدُردانه

**سوە**[٢]: ئاوەڵناو. کاڵ؛ خاو؛ نەگەیشتوو ☰ کال

**سوەقە** / s(i)weqe/: ناو. کۆخە؛ قۆزە ☰ سُرفه

**سوەی** / s(i)wey/: ناو. سبەی؛ سۆزی ☰ فردا

**سوەیل** / s(i)weyl/: ناو. گەلاوێژ؛ گەڤێژ؛ گولاوێژ؛ لاڤێژ؛ سیوەیل؛ پەرەک؛ گەشترین ئەستێرەی کەلووی کەشتی و دووهەم ئەستێرەگەشەی ئاسمان کە لە ژووربەری ٣٧°ی باکوورییەوە نابینرێ ☰ ستارەی سُهیل

**سوهان** / suhan/: ناو. سنێر؛ شیاکە؛ ڕیخ ☰ سرگین

**سوهتن** / suhtin/: چاوگ. سووتان ☰ سوختن

**سوهر** / suhr/: ناو. سوور؛ سۆر ☰ سُرخ

**سوهراڤ** / suhrav/: ناو. سۆراڤ؛ سووراو ☰ سُرخاب

**سوهرک** / suhrik/: ☜ **سوریجە**

**سوهریچک** / suhrîçik/: ناو. ١. ☜ **سوریتچك** ٢. *[شوورەیی]* کونی قوون ☰ ١. ☜ **سوریتچك** ٢. مقعد

**سوهن** / suhn/: ناو. سام؛ ساو؛ ترس؛ هەیبەت ☰ خوف؛ ترس

**سویار** / suyar/: ☜ **سوار**

**سویاری** / suyarî/: ☜ **سواری**

**سویت** / s(i)wît/: ناو. وارخانێکی بچووک کە دیوی جیاوازی نییە ☰ سوئیت

**سویتلی** / s(i)wîtlî/: ☜ **سوتلی**

**سویتە** / s(i)wîte/: ناو. ١. لەمپەر و پەرژینی کەوپەڕ ٢. چێشتەی نچیر ٣. تەپکە کەرویشک ☰ ١. مانع راه کوچ کبک‌ها ٢. طُعمەی شکار ٣. گودال تلەی خرگوش

**سویجگەر** / s(i)wîcger/: ☜ **سوجگەر**

**سویسکە** / s(i)wîske/: ☜ **سوێسکە**

**سویل** / s(i)wîl/: ناو. ١. ☜ **سقیل** ٢. پلووسک ٣. تاقگە ☰ ١. ☜ **سقیل** ٢. ناودان ٣. آبشار

**سویلاڤ** / s(i)wîlav/: ☜ **سولاڤ**

**سویلک** / s(i)wîlik/: ناو. بەرخ و کاژیلەی ساوا ☰ نوزاد برّه و بُزغاله

**سوین** / s(i)wîn/: ☜ **سونەوە**

**سویند** / s(i)wînd/: ☜ **سوێند**

**سوینەوە** / s(i)wînewe/: ☜ **ساوین**

**سوێ**[١] / s(i)wê/: ناو. ١. سووی؛ سوو؛ داخ و عەزرەت ‹هەڵەبجە لە سوێی هەزاران زیڕە و چریکەی لە هەوکا قەتیس/ .../ شەو و ڕۆژ ئۆقرەم لێ هەڵگیراوە «پەشێو»› ٢. تاسە؛ تامەزرۆیی ‹نەوەستان دەوەستێ بە دەستێ/ کە خاراوی ئیش و ساوای سوێ بێ «سوارە»› ٣. سوێگە؛ **ئاسۆ**؛ زێواری ئاسمان ٤. تەماشا؛ تماشا؛ نیگا ٥. سۆ؛ ساڕێژی برین ٦. ئازار؛ ژان ‹هاتە سوێ دیسان برینم› ٧. سبەینێ؛ سەوزی؛ شەوسۆ ‹ئەم لە دوێنێ پەشێوە، ئەو لە سوێ/ من خەمی هیچوپووچیی ئێستامە «کاک ئەحمەد»› ☰ ١. حسرت ٢. اشتیاق ٣. اُفُق ۴. نگاه ۵. التیام زخم ۶. درد و آزار ٧. فردا

⊡ **سوێ بوونەوە**: ١. غەم خواردن بۆ کەسێک ٢. مردن لە خەمان ٣. زۆر بە کزە و ژان بوون. هەروەها: **سوێ هاتنەوە** ☰ ١. غُصەی کسی را خوردن ٢. از غُصه مُردن ٣. بسیار درد کشیدن

**سوێ**[٢]: ئاوەڵناو. نزیک؛ نێزیک ☰ نزدیک

**سوێبانە** / s(i)wêbane/: ☜ **سوانە**

**سوێتەلی** / s(i)wêtelî/: ☜ **سوتلی**

**سوێدار** / s(i)wêdar/: ئاوەڵناو. خەمبار؛ ئازیەتبار ☰ عزادار

**سوێر** / s(i)wêr/: ئاوەڵناو. ١. سۆڵ؛ سوور؛ سۆڵەخوا؛ شۆر؛ خێرە؛ خوێناوی؛ پڕخوێ؛ نیمەنمەک ‹چێشتی سوێر› ٢. *[مەجاز]* تامەزرۆ؛ بە

ئارەزوو بۆ شتێ ٣. *[مەجاز]* تاڵ؛ ناخۆش (قسە) ‹قسەی سوێر› ☰ ١. شور ٢. بسیار آرزومند ٣. تلخ (سخن)

**سوێراو** / s(i)wêraw/: ناو. سەرچاوەی ئاوی سوێر ☰ چشمەی آب شور

**سوێرخوێ** / s(i)wêrx(i)wê/: ئاوەڵناو. زۆر سوێر؛ زۆر خوێ تێ کراو ☰ بسیار شور

**سوێرقسە** / s(i)wêrq(i)se/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* زۆربڵە؛ فرەوێژ ☰ پُرگو

**سوێرکە** / s(i)wêrke/: ناو. ١. ☜ سوێرە ٢. چەرەس؛ چەرەز؛ شەوچەرە؛ ئاجیل؛ خواردەمەنی تێکەڵ بە وشکەباری گەرمشتە ☰ ١. ☜ سوێرە ٢. آجیل

**سوێروو** / s(i)wêrû/: ناو. ڕەشۆڵە؛ ڕیشۆڵە؛ گاوانی ☰ سار

**سوێرە** / s(i)wêre/: ناو. سوێرکە؛ کاری دەم گەڕاندنی ئاژەڵ بۆ سوێری ☰ اشتیاق دام به نمک

**سوێرەکە** / s(i)wêreke/: ناو. ١. چێشتێ کە لە تۆراخی دەکەن ٢. جۆرێ مازوو ☰ ١. آش دوغ چکیده ٢. نوعی مازوج

**سوێرەلۆک** / s(i)wêrelok/: ئاوەڵناو. سوێری نیوەتاڵ ☰ شور مایل به تلخ

**سوێری** / s(i)wêrî/: ناو. سۆڵی؛ شۆری ☰ شوری

**سوێرێژک** / s(i)wêrêjik/: ☜ سووریجە

**سوێڕ** / s(i)wêř/: ئاوەڵناو. پێچەقێن؛ سوور لەسەر مەبەست ☰ مُصِر

**سوێس** / s(i)wês/: ناو. تارمایی؛ تاپۆ؛ شتی خەیاڵی کە دێتە بەر چاو ☰ شَبَح

**سوێسکە** / s(i)wêske/: ناو. سۆس؛ سۆسک؛ سۆسکە؛ سووسک؛ سووسکە؛ سووسی؛ سوسکە؛ سێسکە؛ سێچکە؛ سویسکە؛ شووشک؛ کاسەکەو؛ گەڤریلە؛ مارەکەو؛ تەیهوو؛ تێ؛ مەلێکە لە تۆرەمەی قەرقاوڵ، لە کەو بچووکترە، نزیک ٢٣ تا ٢٥ سانتیمیتر دەبێ، مل و بەرچێلەی بۆر، ڕەنگی بۆری ئاماڵزەرد، بەر زگی خاڵ خاڵی ڕەش و باڵی خرتۆڵ و گچکەیە، لە قەراغ چۆم و جۆباران دەبینرێ ☰ تیهو

⊡ **سوێسکە کردن:** قونەقون کردن؛ وەک سوێسکە ڕێ چوون ☰ خرامیدن

**سوێسکەڕەشە** / s(i)wêskeřeşe/: ناو. مووزەر؛ پۆڕ؛ زێوەکەو ☰ دُرّاج

**سوێسکەیی** / s(i)wêskeyî/: ناو. جۆرێ هەڵپەڕکێ ☰ نوعی رقص

**سوێسن** / s(i)wêsin/: ☜ سوێسنە

**سوێسنە** / s(i)wêsne/: ناو. سوێسن؛ سۆسن؛ سۆسەن؛ سووسن؛ سووسەن؛ سیسەن؛ گیای سەلکداری هەمیشەیی، بە گەڵای درێژ و باریک و گوڵەهێشووی هەمەڕەنگەی گەورە و بۆنخۆشەوە ☰ سوسن

**سوێگە** / s(i)wêge/: ناو. ئاسۆ؛ زێواری ئاسمان ☰ اُفُق

**سوێل** / s(i)wêl/: ☜ سمێڵ

**سوێڵ** / s(i)wêł/: ☜ سمێڵ

⊡ **سوێڵ کەسێ جەڕ دان:** *[کینایە]* کەسێک تەمێ کردن ☰ سبیل کسی را دود دادن

**سوێڵدار** / s(i)wêłdar/: ☜ سمێڵی

**سوێڵقەوی** / s(i)wêłqewî/: ئاوەڵناو. *[پلار]* ١. سمێڵزل ٢. ملهوڕ ☰ ١. سبیل کُلُفت ٢. زورگو

**سوێڵی** / s(i)wêłî/: ☜ سمێڵی

**سوێن** / s(i)wên/: ☜ سوێند

**سوێند** / s(i)wênd/: ناو. سوێن؛ سۆند؛ سۆکەند؛ سووند؛ سوێنگ؛ سویند؛ قەستەم؛ قەسەم: ١. کار و ڕەوتی سوێند خواردن ٢. وشە یان ڕیزوشەیەک بۆ ئەو مەبەستە ☰ ١و٢. سوگند

⊡ **سوێند خواردن:** قەسەم خواردن: ١. سوێند بەرز دان؛ گەوا گرتنی کەس یان شتێکی پیرۆز بۆ

دروستی وتەی خۆ (سوێند دەخۆم بە خاکی کوردستان، پشت لە دژمن نەکەم) ٢. مەرج کردن لە سەر ڕووداوێکی نالەبار بۆ پێداگری لە سەر قسەی خۆ (وەک: کوێر بم ئەگەر قسەی وام کردبێ) ▤ ١و٢. سوگند خوردن

**سوێند دان:** قەسەم دان؛ سوێند پێ دان (سوێندیان دا ڕاستی بڵێ) ▤ سوگند دادن

**سوێند شکاندن:** پێ نانە سەر سوێند و بەڵێنی خۆ ▤ سوگند خود را زیر پا گذاشتن

**سوێندخۆر** / s(i)wêndxor/: ناو. ١. هاوپەیمان ٢. کەسێ کە سوێند دەخوات ▤ ١. هم‌پیمان ٢. آن کە سوگند می‌خورد

**سوێندکاری** / s(i)wêndkarî/: ناو. پەیمانی بە کۆمەڵ ▤ پیمان دستەجمعی

**سوێندگر** / s(i)wêndgir/: ناوەڵناو. سوێندگیر؛ خوداگیر؛ تایبەتمەندی کەسێ کە لە سوێندی بە درۆ تووشی بەڵا بووبێ ▤ بلادیدە از سوگند دروغین

**سوێندگیر** / s(i)wêndgîr/: ☜ **سوێندگر**

**سوێنکە** / s(i)wênke/: ناو. سونکە؛ سۆنکە؛ سووتکە؛ بەرماوی ورد لە سابوون یان کەشک (... کۆلکەمەلا و سوێنکە کەشکی ئورووپا چووی هیچ فێرنەبووی خۆپفدەری شات‌وشووت‌کەر ... «هەژار، *هەنبانە بۆرینە*») ▤ تەماندەی صابون یا کشک سابیدە

**سوێنگ** / s(i)wêng/: ☜ **سوێند**

**سوێنە** / s(i)wêne/: ناو. تەشتی گڵێنە؛ تەشتی سواڵەتی ▤ تشت سُفالین

**سۆ**[1] / so/: ناو. ١. کونی دەرزی ٢. گومان؛ دوودڵی (باش نەخوێنی، بێ سۆ سەر ناکەوی) ٣. کزە و ژان (وە مەرگت دایم زامم هەر بە سۆن/ دەرد وێم کەمەن ئیمجار نۆبەی تۆن «مەولەوی») ٤. سارێژ (برینەکەم هاتۆتەوە سۆ) ٥. گیایەکە دەگەڵ پەنیر دەکرێ ٦. بەهرە؛ کەڵک (کار دەگەڵ تۆ بێ سۆیە) ٧. دیق؛ دەردەباریکە؛ نەخۆشینی سیل ٨. دووکەڵی پەڕۆی سووتاو (بۆ سۆ) ٩. سبەی؛ سۆزی (دوو سۆ) ١٠. کەپەک؛ درشتەی ئارد کە لە سەر هێڵەگ دەمێنێ ١١. کرێژی سەر ١٢. داسوولکە؛ پرزەی گوڵەگەنم و جۆ ١٣. نوور؛ ڕووناکی ١٤. ئاسۆ؛ کەنارەی ئاسمان ▤ ١. سوراخ سوزن ٢. گمان ٣. درد و سوزش ۴. التیام ۵. گیاهی است کە با پنیر می‌آمیزند ۶. فایدە؛ سود ٧. بیماری سل ٨. دود پنبەی سوختە ٩. فردا ١٠. نُخالە ١١. شورەی سر ١٢. اخگل؛ داسە ١٣. روشنایی ١۴. اُفُق

⊡ **سۆ بۆ کەسێ/ شتێ کردن** زۆر بە تاسەی کەسێ/ شتێکەوە بوون ▤ بسیار مُشتاق کسی/ چیزی بودن

**سۆ کردن** هاتنە لادا لە بەر ئێش ▤ غش کردن از درد

▪ **سۆ**[2]: پاشەوشە. ١. گڕۆ؛ گڕۆن؛ هەو (جەرگەسۆ؛ گەدەسۆ؛ برینەسۆ) ٢. دزە؛ مەردە (چلکەسۆ) ▤ ١. التهاب ٢. نفوذ

**سۆبا**[1] / soba/: ناو. ١. ☜ **سۆپا** ٢. مەلەوان ▤ ١. ☜ **سۆپا** ٢. شناگر

**سۆبا**[2]: ناوەڵناو. ڕەبەن؛ بێ‌ژن ▤ مُجرد

**سۆباهی** / sobahî/: ☜ **سۆبایی**

**سۆبایی** / sobayî/: ناو. سۆباهی؛ مەلە؛ مەلەوانی ▤ شنا

**سۆباییکەر** / sobayîker/: ناو. ئاوژەن؛ مەلۆو؛ مەلەوان ▤ شناگر

**سۆبە** / sobe/: ☜ **سۆپا**

**سۆبەت** / sobet/: ناوەڵناو. عجایب؛ سەیر؛ سەمەرە ▤ شگفت

**سۆپ** / sop/: ناو. ١. جووتە گای دابەستراو ٢. ☜ **سوپ** ▤ ١. جُفت گاو آمادەی شُخم ٢. ☜ **سوپ**

**سۆپا** / sopa/: ناو. زۆبا؛ سۆبا؛ سۆبە؛ سۆپە؛ سۆمپا؛ کوورەی ئاگر لە کانزا ▤ بُخاری

**سۆپار / sopar/**: ناو. جۆرێ گاسن 🇮🇷 نوعی گاوآهن

**سۆپاژۆ / sopajo/**: ناو. جووتکار؛ کەسێ کە بە گاجووت زەوی دەکێڵێ 🇮🇷 شُخم‌زن با گاو

**سۆپە / sope/**: ☜ سۆپا

**سۆتک / sotik/**: ناو. سۆتەک؛ سووتەڵ؛ سەربزۆت؛ سەربزووت؛ چلۆسک؛ سەرچومەت؛ سەرسۆت؛ بزووت؛ سەرەبزووت 🇮🇷 نیمسوز

**سۆتکە / sotke/**: ناو. سمڵ؛ گیایەکە بۆنخۆش بۆ دەرمان دەشێ 🇮🇷 گیاه سعد؛ مُشک زمین

**سۆتن / sotin/**: ☜ سوتان

**سۆتە / sote/**: ناوەڵناو. دەهری؛ بێدین 🇮🇷 دهری

**سۆتەک / sotek/**: ناو. ١. ☜ سوتک ٢. ☜ سۆتك ٣. زەوی ئاگر تێبەردراوی سووتاو 🇮🇷 ١. ☜ سوتك ٢. ☜ سۆتك ٣. زمین سوخته

**سۆتەی / sotey/**: چاوگ. سووتان 🇮🇷 سوختن

**سۆتی / sotî/**: ☜ سوتاو

**سۆتیچکە / sotîçke/**: ناو. شیرگرسێن؛ ڕۆنیاسەگیا؛ کەولەگیا 🇮🇷 شیرپنیر

**سۆچنای / soçnay/**: چاوگ. سووتاندن ‹گیروودەی ئافاق دەور گەردوونم/ سەبرت سۆچنا یانەی دەروونم «بێسارانی»› 🇮🇷 سوزاندن

**سۆچیای / soçyay/**: چاوگ. سووتان 🇮🇷 سوختن

**سۆچێو / soçêw/**: ناو. مقەڵی؛ مەنقەڵی؛ مەنگەڵ؛ سکڵ دانی کانزا 🇮🇷 مجمر؛ منقل آتش

**سۆح / soĥ/**: ☜ سبح

**سۆحا / soĥa/**: ☜ سبح

**سۆخت / soxt/**: ☜ سوخت

**سۆخرە / soxre/**: ☜ سوخرە-٢

**سۆخی / soxî/**: ناو. ئاکام 🇮🇷 نتیجه

**سۆخین / soxîn/**: ناوەڵکار. لە ئاکامدا 🇮🇷 در نتیجه

**سۆدە / sode/**: ناو. ١. تراوی کلۆر؛ دەرمانێکە تێکەڵ ئاوی دەکەن، دژگەنی دەکا ٢. بلَخ؛ بەلَخ 🇮🇷 ١. مایع کُلُر ٢. جِرم

**سۆدەرە / sodere/**: ناوەڵناو. شەڕهەڵایسێن؛ مایەفیتنە؛ کتکەنەفتینە 🇮🇷 فتنه‌انگیز

**سۆر / sor/**: ناو. سوور؛ ڕەنگی خوێن 🇮🇷 سُرخ

▣ **سۆری تاری:** سووری تۆخ 🇮🇷 سُرخ تیره

**سۆری کەژ:** سووری ئاڵ 🇮🇷 سُرخ روشن

**سۆراتی / soratî/**: ناو. سووری؛ ڕەنگ سووری 🇮🇷 سُرخ رنگی

**سۆراخ / sorax/**: ☜ سۆراغ

**سۆراغ / sorağ/**: ناو. سۆراخ؛ سالۆخ: ١. ناونیشان؛ شوێن ‹لەو یۆسفە پرسیومە لە بێگانە و یاران/ هەرگیز نییە سۆراغی لە هیچ لاوە دڵی من «بێخود»› ٢. کاری بە دووی شتی گومبوو یان هەر شتێکدا گەڕان ‹کەوتمە سۆراغی› ٣. چۆنیەتی هەست بە جێگەی گومبوو کردن ‹سۆراغم کردووە لە کوێیە› 🇮🇷 ١. ردّ؛ نشان ٢و٣. سُراغ

▣ **سۆراغ کردن:** ١. کەوتنە سۆراغی کەسێ یان شتێک؛ گەڕان بە شوێن شتێ یا کارێکدا ٢. دۆزینەوە؛ دیتنەوە؛ زانین بە شوێن و ماوای شتێ یا کەسێ 🇮🇷 ١. جستجو کردن ٢. رد کسی یا چیزی را یافتن

**سۆراغ نەبون:** ١. دیار نەبوون ٢. گوم بوون؛ نوقمەسار بوون 🇮🇷 ١. پیدا نبودن ٢. محو شدن

**چونە سۆراغ کەسێ/ شتێکەوە:** سەروەختی کەسێ/ شتێ چوون؛ پێ ڕاگەییشتن 🇮🇷 سُراغ کسی/ چیزی رفتن

**سۆراڤ / sorav/**: ناو. بەری دار عەننابی سوور 🇮🇷 ثمر عناب قرمز

**سۆرانی[1] / soranî/**: ناو. ١. شێوەزاری خەڵکی سۆران ٢. زاری کوردی ناوەڕاست، بریتی لە سۆرانی، موکوریانی، ئەردەڵانی؛ جافی، جانی و ... ٣. قۆڵ و سەردەستی درێژ و فش ٤. هەرمێ لاسوورە؛ جۆرێ هەرمێ 🇮🇷 ١. گویش مردم سوران ٢. یکی از چهار شاخه‌ی بزرگ زبان کردی ٣. آستین

بلند لباس کردی ۴. نوعی گلابی

**سۆرانی**[2]: ئاوەڵناو. ١. خەڵکی وڵاتی سۆران، کە بەشێکی گەورە لە باشووری کوردستانە ٢. سەر بە شێوەزاری سۆرانی ٣. سەر بە زاری کوردی ناوەڕاست ⚑ ١تا٣. سورانی

**سۆرانیدار** / soranîdar/: ئاوەڵناو. بە قۆڵ و سەر دەستی درێژەوە دووراو ‹کراس زەماوەنەکەی سۆرانیدار بوو› ⚑ دارای آستین بلند

**سۆراویلک** / sorawîlik/: ☜ **سورەقانگ**

**سۆرپاز** / sorpaz/: ناو. سۆریاز؛ سۆریاس: ١. سیرە کێویلە ٢. گیایەکە دە ئاش دەکرێ ⚑ ١. سیر کوهی ٢. گیاهی آشی

**سۆرپەری** / sorperî/: ئاوەڵناو. جوانی کولمە سوور ⚑ زیبای سُرخ‌گونه

**سۆرپێست** / sorpêst/: ☜ **سورپێست**

**سۆرسۆرک** / sorsorik/: ناو. ستۆکرک؛ ناق؛ بینەقاقە؛ قورقوراگە ⚑ خرخره

**سۆرک** / sorik/: ناو. ١. تاقگە؛ ئاوهەڵدێر ٢. ☜ **سوریجە** ٣. هەرزن؛ کارس؛ گاڵ ٤. گیایەکە ⚑ ١. آبشار ٢. ☜ **سوریجە** ٣. ارزن ۴. گیاهی است

**سۆرگول** / sorgul/: ☜ **سورەگوڵ**

**سۆرگوڵ** / sorguł/: ناو. ١. ☜ **سورەگوڵ** ٢. /کینایە/ سەرپەرستی ماڵ ⚑ ١. ☜ **سورەگوڵ** ٢. سرپرست خانواده

**سۆرنگ** / soring/: ناو. ڕۆنیاس؛ ڕەگی گیایەکە بەن و خامی پێ ڕەنگ دەکەن ⚑ روناس

**سۆرە**[1] / sore/: ناو. ١. منالی هەوێ بۆ ژنی هەوێدار ‹سۆرە لەتێ زۆرە! «مەسەل»› ٢. خزمی بە ملداهاتووی ڕەزاگران ‹سۆرە خۆی چاکە، سۆرەزا خراپە «مەسەل»› ٣. جۆرێ هەنجیری سوور ⚑ ١. بچەی هوو ٢. فامیل مزاحم و گرانجان ٣. نوعی انجیر قرمز

**سۆرە**[2]: ئاوەڵکار. وێدەچی؛ ڕەنگە؛ دوور نییە؛ ئەشێ ⚑ شاید؛ چه بسا

**سۆرەپەن** / sorepen/: ☜ **سورەقانگ**

**سۆرەغەرە** / soreğere/: ناو. ڕەنگێکە نێوان زەرد و قاوەیی ⚑ رنگ زرد مایل به قهوه‌ای

**سۆرەک** / sorek/: ناو. کاری لێدان و کوتانی زۆر بە ئازار ⚑ کُتک‌کاری مُفصل

**سۆرەگوڵ** / soreguł/: ☜ **سورەگوڵ**

**سۆرەمزە** / sorem(i)ze/: ☜ **سیرەمۆزە**

**سۆرەوبوو** / sorewbû/: ☜ **سوربۆوە**

**سۆرەوتۆرە** / sore w tore/: ناو. خزمی سەربار و بێکار ‹ئەی تەکیەنشین شێخی بە سۆرەوتۆرە!/ پێت وا نەبێ هەر مەستییە، کارم زۆرە «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ⚑ فامیل‌های مزاحم و بیکاره

**سۆرەویلک** / sorewîlik/: ناو. ماسیخۆرە؛ شاوە؛ شاهۆ؛ ناوی چەن جۆر باڵندەیە لە قەراخی ئاو دەژین و ماسی دەخۆن ⚑ حواصیل

**سۆری** / sorî/: ئاوەڵناو. خەڵکی ناوچەی سۆران ⚑ اهل منطقه‌ی سوران

**سۆریاز** / soryaz/: ☜ **سۆرپاز**

**سۆریاس** / soryas/: ☜ **سۆرپاز**

**سۆرین** / sorîn/: ناو. تانە؛ سەرکۆنە؛ سەرکۆ ⚑ انتقاد

**سۆرینگ** / sorîng/: ناو. ڕەنگی سوور ⚑ رنگ سُرخ

**سۆڕە** / soře/: ناو. زۆڕە ⚑ صدای خشن گریه

**سۆڕەسۆڕ** / sořesoř/: دەنگەناو. زۆڕەزۆڕ ⚑ صدای متوالی گریه‌ی خشن

**سۆز**[1] / soz/: ناو. ١. دلۆڤانی؛ ئەوەی لە خۆشەویستییەوە بەدی دێ ‹سۆزی دایک بۆ منال› ٢. گفت؛ پەیمان؛ قەوڵ ‹سۆزم پێ داوە و پاشگەز نابمەوە› ٣. شادی؛ خۆشی؛ کەیف ٤. گۆرانی خەمبار ‹سۆزی شمشاڵ ئەخەمە کار دەمی ئێواران/ پۆل ـ پۆل ئافرەت، شیردۆشی جوان، ئەکشێ

بۆ ناو ڕان «گۆران»› ٥. هەستی قـووڵایی دەروون ‹تا کەی چەنی شین ڕۆ وە سەر بەروون/ با وە سۆزی دڵ دوعایـێ کـەروون «مەولـەوی»› ٦. کـوڵ و کەسەر؛ دەرد و ئازار ‹لێم گەڕێ با دەربـڕم سـۆزی دەروون/ لـێم‌گـەڕێ بـا هەڵـوەرێنم ئەشـکی ڕوون «هێمن»› ☰ ١. عاطفه ٢. پیمان ٣. شادی ۴. آهنـگ حزین ۵. احساس درونی ۶ اندوه

⊡ **سۆز کردن:** گۆرانی بە سەبرۆکە گـوتن ☰ تـرنُم کردن

• **سۆز**[٢]: پاشەوشە. سووتێنەر ‹دڵسۆز› ☰ ـ سوز

**سۆزان** / sozan/: ☜ **سوتان**

**سۆزاندن** / sozandin/: ☜ **سوتاندن**

**سۆزانی** / sozanî/: ☜ **سوزانی**

**سۆزاوی** / sozawî/: ☜ **بەسۆز**

**سۆزدار** / sozdar/: ئاوەڵناو. ١. بەسـۆز؛ تێکـەڵ بـە سۆزە ٢. دلۆڤـان؛ میهرەبـان ☰ ١. حُـزن‌انگیـز ٢. مهربان

**سۆزداری** / sozdarî/: ناو. خۆشەویستی؛ دلۆڤانی ☰ محبت

**سۆزرەت** / sozret/: ئاوەڵـناو. سۆسـرەت؛ سـەمەرە؛ سەیر ☰ عجیب

**سۆزک** / sozik/: ناو. هەرزن؛ ئەرزن ☰ ارزن

**سۆزمانی** / sozmanî/: نـاو. ١. ☜ **سـوزانی** ٢. ☜ **سیخوڕ ـ٣**

**سۆزنامە** / sozname/: نـاو. تراژێـدیا؛ خەمنامـە ☰ تراژدی

**سۆزنای** / soznay/: چاوگ. سووتاندن ☰ سوزاندن

**سۆزوو** / sozû/: ☜ **سۆزی**

**سۆزە** / soze/: ناو. ١. سۆز؛ گۆرانی بە دەنگی نـزم ٢. تەزووری سەرما ٣. ئێش و ئازار ‹جـە سـۆزەی شەرار نایـەرەی هیجـران/ جـە ناسـۆر زام تیرەکـەی موژگان «مەولەوی»› ٤. /کنایە/ سروە؛ سۆسە؛ شنە ‹بە سۆزەی با کە سکڵی دڵ گەشاوە/ دەروون پڕسۆز و فرمێسکم خوناوە «هێمن»› ٥. سـۆراخی خەبـەر ☰ ١. ترنُم ٢. سوزش سرما ٣. درد و رنج ۴. نسـیم ۵. سرنخ از خبر

⊡ **سۆزە کردن:** ١. بە ئارامی و دەنگی نزم گـۆرانی گوتن ٢. شتێ لـە خەبـەر دەس‌کـەوتن ☰ ١. ترنُم کردن ٢. سر نخ یافتن

**سۆزی**[١] / sozî/: نـاو. سـب؛ سـبە؛ سـبەی؛ سـبح؛ سبحە؛ سبەینێ؛ سـبەینە؛ سـبێ؛ سـۆزوو؛ ڕۆژی داهاتوو ☰ فردا

**سۆزی**[٢]: ئاوەڵـکار. سـبەی؛ سـبەینێ؛ سـبحەی؛ سبحە؛ سبحا؛ سبەینە؛ سـبێ؛ سـۆزوو؛ لـە ڕۆژی داهاتوودا ☰ فردا

**سۆزیان** / sozyan/: ☜ **سوتان**

**سۆزیای** / sozyay/: چاوگ. سووتان ☰ سوختن

**سۆزیشەو** / sozîşew/: ناو. باناشەو؛ سـبەی‌شـەوێ ☰ فرداشب

**سۆژ** / soj/: ناو. سۆز؛ سۆژ ☰ سوز

**سۆژان** / sojan/: ☜ **سوتان**

**سۆژاندن** / sojandin/: ☜ **سوتاندن**

**سۆژتاندن** / sojtandin/: ☜ **سوتاندن**

**سۆژە** / soje/: ناو. ١. بێگار؛ سۆخرە ٢. داد و هـاوار ☰ ١. بیگاری ٢. فریاد و فغان

**سۆژەک** / sojek/: نـاو. خاکە؛ ئـاخویرک؛ پێشـکەی زۆر ورد ☰ پشّەی خاکی

**سۆژین** / sojîn/: ☜ **سوتان**

**سۆس** / sos/: ناو. ١. سۆست؛ سۆسک؛ سوێ؛ سـۆ؛ پـینی؛ کەپـەک؛ کرپـک؛ کەلپـەک؛ کەلـپەک؛ کەلپ؛ توێکڵی دانەوێڵەی لە دەستاڕکراو کـە لـە دابێژراندا لە ئاردەکەی جـوێ دەبێتـەوە ٢. ☜ **سوێسکە** ٣. هەرکام لەو ماکانەی بە بەهارات تـام و بۆنخـۆش کـراون و وەک تراوێکـی خەسـت دەیکەنە سەر زەلاتە و چێشـتدا ☰ ١. سـبوس ٢. ☜ **سوێسکە** ٣. سُس

**سۆست** / sost/: ناو. ١. ☜ **سۆس ـ١** ٢. سۆز؛ پەیمان؛ شەرت ☰ ١. ☜ **سۆس ـ١** ٢. عهد؛ پیمان

**سۆسرەت** / sosret/: ☜ **سوزرەت**

**سۆسک** / sosk/: ناو. ١. ☜ **سۆس ـ١** ٢. ☜ **سوێسکە**

**سۆسکە** / soske/: ☜ **سوێسکە**

**سۆسن** / sosin/: ☜ **سوێسنە**

**سۆسە** / sose/: ناو. ١. سووسە؛ چۆنیەتی بۆچوون بە گومان ٢. سروە؛ شنە؛ بای نەرم ☰ ١. کاوش ذهنی ٢. نسیم

⊡ **سۆسە کردن**: ١. سۆراخ کردن ٢. بۆ کردن؛ بۆ هەڵکێشان ‹لەوساکەوە، جگەرگۆشەم! کەسێک نییە هەڵکشانی بیانان و داکشانی زۆزانەکان سۆسە بکات «پەشێو»› ☰ ١. سُراغ گرفتن ٢. بو کشیدن

**سۆسەن** / sosen/: ☜ **سوێسنە**

**سۆشین** / soşîn/: ناو. گیایەکە ☰ گیاهی است

**سۆعبەت** / so'bet/: ناو. گاڵتە؛ گەپ ☰ شوخی

**سۆغرە** / soğre/: ☜ **سوخرە ـ٢**

**سۆغین** / soğîn/: چاوگ. پێکهانین؛ ئەنجام دان ☰ انجام دادن

**سۆفەقیتە** / sofeqîte/: ☜ **سوریلی**

**سۆفی** / sofî/: ئاوەڵناو. شوێنگری هەر یەکە لە ئایینگەلی سۆفیان ☰ صوفی

**سۆفیاتی** / sof(i)yatî/: ☜ **سۆفییەتی**

**سۆفیایەتی** / sof(i)yayetî/: ☜ **سۆفییەتی**

**سۆفیلکە**[1] / sofîlke/: ناو. ١. ☜ **سوریلی** ٢. جۆری کوللەی شینی پچووک ☰ ١. ☜ **سوریلی** ٢. نوعی ملخ سبز رنگ

**سۆفیلکە**[2]: ئاوەڵناو. ڕدێنداری سیس و کز و چکۆلە ☰ ریشوی لاغرمُردنی

**سۆفیلە** / sofîle/: ناو. ١. دەنکە درشتەی ناو تەزبیح ٢. دارێکە دە سەر تۆپی خەرمانی ڕادەکەن ☰ ١. مُهرەی درشت تسبیح ٢. چوبی کە بالای خرمن گذارند

**سۆفیەقیتە** / sof(i)yeqîte/: ☜ **سۆفییەقیتە**

**سۆفییەتی** / sofîyetî/: ناو. سۆفیاتی؛ سۆفیایەتی؛ ئامۆژەیەکی عیرفانی لە بارەی پەیوەندی خودا و مرۆڤ و ڕێگەی ناسینی خوداوە ☰ صوفیگری

**سۆفییەقیتە** / sofîyeqîte/: ناو. سۆفیەقیتە؛ قازەلاخ؛ قازلاخ؛ قازلاخی؛ باڵدارێکە لە چێشکە گەورەترە و پۆپەی هەیە ☰ چکاوک

**سۆڤ** / sov/: ناو. سەنگینی؛ قورسی ☰ سنگینی

**سۆقات** / soqat/: ☜ **سەوقات**

**سۆقاتی** / soqatî/: ☜ **سەوقاتی**

**سۆقان** / soqan/: ☜ **ئێسك**

**سۆک**[1] / sok/: ناو. *[شوورەیی]* سۆکە؛ سووک؛ حینچکە ☰ کله (حین مقاربت)

⊡ **سۆک پێوە نان**: ☜ **سوك پێوەدان**

**سۆک لێدان**: ☜ **سوك پێوەدان**

**سۆک**[2]: ئاوەڵناو. سووک؛ سفک: ١. بە قورسایی کەمەوە ٢. *[مەجاز]* کەمبایەخ. هەروەها: **سۆک بوون**؛ **سۆک کردن** ☰ ١. سُبک ٢. حقیر

⊡ **سۆک لێنەوین**: ☜ **سوك لێنەوین**

**سۆک**[3]: دەنگەناو. لوورەی سەگ لە تاو کردنی دێڵدا ☰ زوزەی سگِ مقابل دله

**سۆکا** / soka/: ☜ **سوكسوكە**

**سۆکایەتی** / sokayetî/: ☜ **سوکایەتی**

**سۆکن** / sokin/: ناو. دۆخی ماتە هەڵگرتنی کەو لە ترس ڕاوچی ☰ حالت مات شدن کبک از ترس شکارچی

**سۆکنای** / soknay/: چاوگ. *[شوورەیی]* سووک پێوە دان ☰ کله زدن (در جماع)

**سۆکوم** / sokum/: ناو. بیچم؛ سەروسەکوت ☰ سیما

**سۆکە** / soke/: ☜ **سۆك**[1]

**سۆکەخەو** / sokexew/: ☜ **سوکەڵەخەو**

**سۆکەسۆک** / sokesok/: ☜ **سیکمەسیکم ـ٢**

**سۆکەند** / sokend/: ☜ سوێند

⊡ **سۆکەند خواردن:** قسەی گومان لە دڵ دەرکردن؛ سوێند خواردن ☰ سوگند یاد کردن

**سۆکی** / sokî/: ناو. ١. ☜ **سوکی** ٢. ئامرازی ساوار کوتان ☰ ١. ☜ **سوکی** ٢. ابزاری شبیه هاون برای کوبیدن بلغور

**سۆکین** / sokîn/: ناو. بناخە؛ بناغە؛ خیم؛ هیم ☰ اساس؛ بُنیاد

**سۆل** / sol/: ناو. ١. پێلاو؛ کەوش ٢. سۆلک؛ کەوشی سووکەڵەی بێ‌پانیە ☰ ١. کفش ٢. دمپایی

**سۆلاڤ** / solav/: ☜ **سولاڤ**

**سۆلان** / solan/: ناوەڵناو. ڕەسەن؛ جسن؛ هێلاو ☰ اصیل

**سۆلبەند** / solbend/: ناو. ١. بەنی کەوش ٢. نالبەند ☰ ١. بند کفش ٢. نعلبند

**سۆلدروو** / sold(i)rû/: ناو. سۆلکەر؛ پێلاودوور؛ کەوشدوور ☰ کفشدوز

**سۆلسۆلە** / solsole/: ناو. گۆشەبڕکە؛ دووکلکە ☰ گوشخیزک

**سۆلک** / solik/: ناو. سۆل؛ کەوشی سووکەڵە ☰ دمپایی

**سۆلکەر** / solker/: ☜ **سۆلدروو**

**سۆلۆلە** / solole/: ناو. بەچکە دووپشک؛ بێچووی دمارەکۆڵ ☰ بچه عقرب

**سۆلە** / sole/: ناو. هەلاش؛ چربی و گیا بۆ بن قوڕەبان ☰ گیاهی که زیر گل اندود بام گذارند

**سۆلین** / solîn/: ☜ **سۆلینە**

**سۆلینە** / solîne/: ناو. سۆلین: ١. گونجە؛ ڕێگەئاوی لە سوالەت ٢. گولووک؛ گولدەم؛ خونچە ☰ ١. تنبوشە؛ آبراه سفالین ٢. غنچە

**سۆڵ**[1] / soł/: ناو. سەهول؛ یەخ ☰ یخ

**سۆڵ**[2]: ناوەڵناو. پڕخوێ؛ خوێ‌داوی؛ سوور ☰ شور

**سۆڵ**[3]: پێرۆ. ← **سپی‌وسۆڵ؛ سفت‌وسۆڵ**

**سۆڵان** / sołan/: ناو. ١. گوڵی پۆپەکەڵەشێرە ٢. هەستی سووزانی پێست ☰ ١. گل تاج‌خروس ٢. احساس سوزش در پوست

**سۆڵاندنەوە** / sołand(i)newe/: چاوگ. چووزاندنەوە؛ سووتاندنەوە؛ سۆڵنایۆ ‹ناو لووتم سۆڵاندەوە› ☰ به سوزش آوردن (پوست)

**سۆڵانەوە** / sołanewe/: چاوگ. چووزانەوە؛ سووتیانەوە (پێست) ☰ سوزش داشتن (پوست)

**سۆڵبەند** / sołbend/: ناو. ١. بەنی کەوش ٢. نالبەند ☰ ١. بند کفش ٢. نعلبند

**سۆڵبەندان** / sołbendan/: ناو. بەستەڵەک ☰ یخبندان

**سۆڵخوا**[1] / sołx(i)wa/: ناو. ئاوی سوێرکراو بۆ شیرەبەلال تێ خستن ☰ آب شور بلالی

**سۆڵخوا**[2]: ☜ **سۆڵوخوا**

**سۆڵنایۆ** / sołnayo/: ☜ **سۆڵاندنەوە**

**سۆڵوخوا** / soł û x(i)wa/: ناوەڵناو. سۆڵخوا؛ سوێر؛ سوور؛ سۆڵ؛ شۆر ☰ شورمزه

**سۆڵە** / sołe/: ناو. ١. بەستەڵەک ‹سەرما و سۆڵە› ٢. سەرمای توند ٣. شۆڵە؛ بلێسە ٤. ڕەوتی چڵ دانی ئەندام ٥. چووزانەوەی پێست ٦. جۆرێ دووپشکی پچووک ٧. ترووسکەی لە دوور ‹سۆڵەی چرا› ☰ ١. یخبندان ٢. سرمای سخت ٣. شُعله ٤. تپش عضو از درد ٥. سوزش پوست ۶. نوعی کژدُم کوچک ٧. سوسو از دور

**سۆڵەچرا** / sołeç(i)ra/: ناو. چۆڵەچرا؛ خەتیرە ☰ مشعل چوبی

**سۆڵەخانە** / sołexane/: ناو. ساردداو؛ ژێرخان ☰ سردابه

**سۆڵەخوا** / sołex(i)wa/: ☜ **سۆڵخوا**

**سۆڵەرمە** / sołerme/: ناو. چلوورە؛ شیشەسۆڵ ☰

دنگاله

**سۆڵەسۆڵ** / solesol/: ☜ **سۆڵەسۆڵە ـ١**

◙ **سۆڵەسۆڵ کردن**: کەوتنە چووزانـەوە؛ دۆخـەدۆخ کردن ⊻ به سوزش آمدن

**سۆڵەسۆڵە** / solesole/: ناو. ١. سۆڵەسۆڵ؛ دۆخـی چووزانەوە لە پێسـت یـان لـە زمانـدا ٢. جـۆرێ دووپشکی ورد ⊻ ١. سوزش پوست و زبان ٢. نوعی کژدُم کوچک

**سۆڵەکە** / soleke/: نـاو. لۆرکی سـۆڵ ⊻ محصـول نمکین تیزاب پنیر

**سـۆڵیانەوە** / solyanewe/: چـاوگ. سۆڵـــینەوە؛ سووتانەوە؛ سووزیانەوە؛ چووزانەوە ⊻ بـه سـوزش آمدن پوست

**سۆڵیایۆ** / solyayo/: ☜ **سۆڵیانەوە**

**سـۆڵین** / solîn/: نـــاو. گیایـــەکی خۆڕســـکی کوێستانییە ⊻ گیاهی است

**سۆڵینەوە** / solînewe/: ☜ **سۆڵیانەوە**

**سۆما** / soma/: نـاو. ١. ڕووناکی چاو؛ هێزی دیـتن ‹خەیلێوەن پالات نە چەم پێوارەن/ سـۆمای بینـاییم تاریک و تـارەن «مـەحزوون»› ٢. ئاسـۆ؛ قـەراخی ئاسمان ‹لە کاتێکا کنارەکـە داپۆشـیوە، ئـەوی کـە دەبێ داپۆشـێ، سـۆمای لـێ نەگوێزتۆتـەوە و هـیچ ڕەشکەوپێشکەشـی نـەکرد «هـەژار، *قورئـان*»› ٣. تڕووسـکەی ڕوونـاکی لـە دوور ‹سـوب نـە جاسووسـگەی ملـەی سـەربەرزان/ چـۆن سـۆمای خورشید شەوق مەکەرد هەرزان «مەولـەوی»› ⊻ ١. سوی چشم ٢. اُفق ٣. سوسوی روشنایی

**سۆمایی** / somayî/: ناو. ١. هێزی چاو؛ بینـایی ٢. ڕەشێنە؛ بیلبیلە ⊻ ١. نیروی دید ٢. مردُمک چشم

◙ **سۆمایی داهاتن**: *[کنایه]* کوێر بوون ⊻ نابینا شدن

**سۆمپا** / sompa/: ☜ **سۆپا**

**سۆمەر** / somer/: ناو. مەلە ⊻ شنا

**سۆن** / son/: ناو. شیاکە؛ ڕیخ؛ سەنێر ⊻ سرگین

**سۆنت** / sont/: ناو. کون؛ کونا ⊻ سوراخ

**سۆنتن** / sontin/: چاوگ. سمین؛ کـون کـردن ⊻ سوراخ کردن

**سۆند** / sond/: نـاو. ١. ☜ **سـوێند** ٢. ئـامرازی لێگەڕان یان هەراو کردنەوەی دەراوێکی لەش ⊻ ١. ☜ **سوێند** ٢. سوند؛ میل

**سۆنک** / sonk/: ناو. خۆڵی زۆر ورد ⊻ گرد و غبار

**سۆنکە** / sonke/: نـاو. ١. ☜ **سـولکە** ٢. هـەل؛ دەرفەت ⊻ ١. ☜ **سولکە** ٢. فُرصت

**سۆنگ** / song/: ناو. سۆنگە؛ بۆنە ‹جە سـۆنگ تـۆوە بەهەشت مەدا پێم/ وەرنە چ کەسم؟ کێ مەزانۆ کێم؟ «بێسارانی»› ⊻ سبب

**سۆنگە** / songe/: ناو. هۆ؛ بۆنە؛ بۆن ⊻ سبب

◙ **لە سۆنگەی**: به هۆی؛ لە بەر ‹خەڵکی ... بێتاوان لە سۆنگەی مندا ئەو هەموو زیانەیان پـێ گەیشـت «هێمن»› ⊻ به سبب

**سۆنە** / sone/: نـاو. سـۆنێ؛ سـوونە؛ سەرکەسـک؛ سەرسـەوز؛ مەلێکـە لـە تـیرەی مراوییـەکان لـە تۆرەمەی وەردۆک، ٦٠ سانتیمیترە، نێرە سەری سـەوزە، سـێ‌ــچوار تـووکی ڕەش لـە سـەر گلێنجەی هەڵگەڕاونەتەوە، دنـدووکی زەردە، بـە پـۆل دەگـەڕێن، لـە گـۆل و بەنـداو و چەمانـدا دەبینـرێ ‹هەڵـەم بپۆشـە! نـەچی گـیف بـبی لـە سەرکۆنەم/ بترسـە ڕۆژێ ئـەتۆش تـەڕ ببی، مەڵـێ سۆنەم! «هەژار، *شەرەفنامە*»› ⊻ اُردک کلەسبز

**سۆنەر** / soner/: ☜ **سونۆگرافی**

**سۆنەڤیرک** / sonevîrik/: ناو. باڵدارێکی ئاوییە، لـە تۆرەمەی مراوی ⊻ نوعی مرغابی

**سۆنەیی** / soneyî/: ناو. هەڵـپەڕکێیەکی کوردییـە ⊻ نوعی رقص کردی

**سۆنی** / sonî/: ناو. ساسی؛ پند؛ جووجوو ⊻ ساس

**سۆنێ** / sonê/: ☜ **سۆنە**

**سـۆور** / sowir/: نـاو. پەڵـــخوڕ؛ کـــای‌خـــوراوی

هەرسەک نەبووی ناوزگی ئاژەڵ ☜ کاه هضم نشده در شکم حیوان

**سۆوری** / sow(i)rî/: ناو. نێری پێشەنگ؛ ڕەمکێشی گەلە ☜ پیشاهنگ گله

**سۆهتن** / sohtin/: ☜ **سوتان**

**سۆهری** / sohrî/: ☜ **سوری**

**سۆیلانە** / soylane/: ناو. جۆرێ گوڵی جوان و بۆنخۆش ☜ گُلی زیبا و خوشبو

**سۆیە** / soye/: ناو. سبەی؛ سبحەی؛ سۆزی ☜ فردا

**سو**[1] / sû/: ناو. ١. ئێرەیی؛ بەخیلی ٢. تاسە؛ تامەزرۆیی ٣. فایدە؛ قازانج ٤. بەزەیی؛ ڕوحم ٥. گلەیی؛ گازن ٦. خێزانی ماڵ ٧. کونی قوون ٨. سۆزی؛ سبەی؛ ڕۆژی دوایی ٩. بەیانی زوو؛ بەرەبەیان ١٠. داخ و حەسرت ١١. گەوڕ؛ پشتێر ‹گا سوو› ١٢. کاری تیژ کردن وە هەسان ١٣. خەم؛ خەفەت ١٤. قازانجی پارەی قەرز ☜ ١. رشک؛ حسد ٢. اشتیاق ٣. سود ۴. ترحُم ۵. گِله ۶ اهل و عیال ٧. مقعد ٨ فردا ٩. بامداد ١٠. حسرت ١١. طویله ١٢. عمل تیز کردن ١٣. غم ١۴. بهره

▪ **سو**[2]: پاشەوشە. سواو: ١. سیویاگ ‹دەمەسوو› ٢. ساویاگ ‹چلکەسوو› ☜ ١. ساییده ٢. مالیده

**سوپ** / sûp/: ناو. شۆربا؛ شلە؛ چێشتی تەڕ، بریتی لە: گۆشتی مریشک، سەوزی و دانەوێڵە ☜ سوپ

**سوپاپ** / sûpap/: ناو. گوڵبێنە؛ گۆلۆ؛ گوڵۆنە؛ گوڵۆێنە؛ ئامێرێ کە هاتوچۆی تەوشێک (تراو، گاز) لە نێو لوولەدا بە بەستن و کرانەوەی ڕێک دەخا ☜ سوپاپ

**سوپخۆری** / sûpxorî/: ناو. دەفری دەمهەراوی دەرخۆنەدار کە چێشتی تێ دەکەن و دەیهێننە سەر سفرە ☜ سوپخوری

**سوپر** / sûpir/: ☜ **سوپێر**

**سوپرمارکت** / sûpirmarkit/: ☜ **سوپێرمارکێت**

**سوپەرەست** / sûperest/: ☜ **سودپەرەست**

**سوپێر** / supêr/: ناوەڵناو. سووپر؛ هەرەباش؛ بێ کەموکووڕی ☜ سوپر

**سوپێرمارکێت** / sûpêrmarkêt/: ناو. سووپرمارکت؛ فرۆشگای گەورە کە چاوەی زۆری بۆ ڕانانی شتومەک هەیە ☜ سوپرمارکت

**سوپێرمەن** / sûpêrmen/: ناو. قارەمانێکی خەیاڵی زلهێز لە کتێبە کامیکەکانی ئەمریکایی ☜ سوپرمن

**سوت** / sût/: ناو. ١. ☜ **سوتار**[1]ـ١ ٢. قازانجی پارەی قەرز ٣. خۆڵی کاغەزی سووتاو ٤. شیر (خواردنەوە) ☜ ١. ☜ **سوتار**[1]ـ١ ٢. بهره ٣. خاکستر کاغذ ۴. شیر (خوراکی)

**سوتار**[1] / sûtar/: ناو. سووتاڵ: ١. سووت؛ قووڵکەی داو تێدا نانەوە ٢. تەڵە؛ داو؛ تەپکە ☜ ١. چالەی دام ٢. دام

**سوتار**[2]: ناوەڵناو. سووتاڵ؛ سنۆتە؛ سنۆرتە ☜ حرامزاده

**سوتاڵ** / sûtal/: ☜ **سوتار**

**سوتان** / sûtan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //سووتای؛ دەسووتێی؛ بسووتێ// سچیان؛ سۆتن؛ سۆزان؛ سۆزیان؛ سووزان؛ سووزیان؛ سووژیان؛ سۆژان؛ سۆژین؛ سۆهتن؛ سووتن؛ سووتیان؛ سووچان؛ سووچنای؛ سووچیای؛ سۆتەی: ١. ئاگر تێ بەربوون ٢. *[مەجاز]* فەوتانی قەرز ٣. *[مەجاز]* تێشکان؛ مایەپووچ بوون؛ نابووت بوون ٤. *[مەجاز]* دۆڕاندن؛ تێپەڕ بوون لە ڕادەی دیاریکراو دە کایەدا ☜ ١. سوختن ٢. سوخت شدن (قرض و وام) ٣. ورشکست شدن ۴. سوختن در بازی

■ ناوەڵناوی بەرکاری: سووتاو/ چاوگی نەرێنی: نەسووتان

**سوتاندن** / sûtandin/: چاوگ. تێپەڕ. //سووتاندت؛ دەسووتێنی؛ بسووتێنە// سچاندن؛ سچانن؛ سۆزاندن؛ سۆژتاندن؛ سووتانن؛ سۆژاندن؛

ســووزاندن؛ ســووزانن؛ ســووژاندن؛ شــەوتاندن؛ شوتاندن؛ داچزاندن؛ سوچانن؛ سووچانن؛ سزانن؛ سـۆچناى: ١. ئـاگردان؛ گـڕ تـێبـەردان؛ بـۆ سووتەمەنی و بەرهەم هێنانی گەرما، کەڵـک لـە شـتێ وەرگـرتن ‹بـە ڕۆژێـک ٢٠ لیتـر نـەوت دەسووتێنێ› ٢. هەڵکردن؛ داگرساندن؛ بۆ بەرهەم هێنانی ڕووناکی کەڵک لە شتێ وەرگرتن ٣. بـە هۆی ئاگر یان گەرماوە، تێدا بـردن ‹سووتاندنـی زبڵوزاڵ› ٤. *[مەجاز]* ئاور دان؛ ئاگر تێبەردان؛ زۆر تووڕەکردن ٥. *[مەجاز]* ئێشاندن؛ تەزاندن؛ ئازراندن یـان خـەمی یـەکجاری پـێ دان ٦. *[پزیشکی]* لابردنی بالووک و خاڵ بە لەیزر یان کارەبـا یـان ماکی کیمیاوی ٧. تووزاندن؛ بە داغ یان گـەرمی، ئازار گەیاندن ‹ئاڵەتەکە زار و زمانمی سـووتاند› ٨. سووتاندنەوە؛ سـۆڵاندنەوە؛ کووزاندنـەوە؛ تووشـی کزە و چووز کردن 🇮🇷 ١. سوزاندن ٢. روشن کـردن ٣. آتـش زدن ۴. عصـبانی کـردن ۵. غصـه دادن ۶. سوزاندن (لکه، خال، زگیل و ...) ٧. سوزاندن (مزەی تُند) ٨. به سوزش آوردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەسووتاندن

**سووتاندنەوە** / sûtand(i)newe/: چاوگ. سووتاندن؛ سۆڵاندنەوە؛ کووزاندنەوە 🇮🇷 به سوزش آوردن

**سووتانن** / sûtanin/: ☜ **سووتاندن**

**سووتانەوە** / sûtanewe/: چـاوگ. تێنەپـەڕ. //سووتایەوە؛ دەسووتێیەوە؛ بسووتێوە// سـووتیانەوە؛ سـووزانەوە: ١. برژانـەوە؛ تووزانـەوە؛ چووزانـەوە؛ چووزینـەوە؛ کاویانـەوە؛ کزانـەوە؛ هەڵـتووزان؛ ئەوەکزیەی؛ کزیـایوە؛ هەسـتی ژانی پێسـت بـە هۆی لێکـەوتنی داخـی ٢. کزانـەوە؛ چووزانـەوە؛ خورانەوە؛ هەستی ژان بە هۆی تێرۆچوونی شتێ (وەک: چز، دڕک، فیشەک و...) لـە پێسـتدا 🇮🇷 ١. سوختن (پوست) ٢. دچار سوزش شدن (پوست)

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: سووتاوەوە/ چـاوگی نـەرێنی: نەسووتانەوە

**سووتاو** / sûtaw/: ئاوەڵـناو. سـوتی؛ سـووتە؛ سووزیاگ؛ سووتیاگ؛ سووزیاو؛ سووژیاو: ١. ئـاگر تێبەردراوی لە بەینچوو ٢. *[مەجاز]* فەوتاو (قەرز) ٣. *[مەجاز]* دەسمایـە لـە دەسچـوو ٤. *[مەجاز]* تێپـەڕبوو لـە ڕادەی دیـاریکراو دە کایـەدا 🇮🇷 ١. سوخته ٢. سوخته (قرض) ٣. ورشکسته ۴. سـوخته (در بازی)

**سووتاوە** / sûtawe/: نـاو. پێسـتێ کـە تووشـی سووتانەوە بووە 🇮🇷 پوستی که دچار سوزش شده

**سووتخۆر** / sûtxor/: نـاو. سـووخۆر؛ سـووخوەر؛ سـوودخۆر؛ قـەبال؛ کەسـێ کـە لـە بەرانبـەر وەرگرتنی بەهرەوە، پارە بە وام دەدا بە خەڵک 🇮🇷 رباخوار

**سووتک** / sûtik/: نـاو. سـۆتک؛ سـووتوو؛ سـوتوو؛ خۆڵەمێشی نان و لۆکە و کاغەز 🇮🇷 خاکستر

**سووتکە**[1] / sûtke/: ☜ **سوێتکە**

**سووتکە**[2]: پێشوشە. ١. وردە؛ ڕێزمـ ‹سووتکەسابوون› ٢. خۆڵەمێش؛ بووڵ ‹سووتکەسگار› 🇮🇷 ١. خُـرده ٢. خاکستر

**سووتلی** / sûtlî/: نـاو. سویتلی؛ سوێتەلی؛ قەپاتمـە؛ ژنی بێ مارەیی و بەکرێگـیراو بـۆ ماوەیـەک 🇮🇷 همسر موقتی

**سووتمان** / sûtman/: نـاو. شەوات؛ ڕەوتی ئاگر بـەر بوونەوە؛ گڕ گرتنی کوتوپڕی جێگـە یـان شـتێ (خانوو، ماشێن، جەنگەڵ و...). هەروەها: **سـووتمان کەوتنەوە** 🇮🇷 حریق؛ آتش‌سوزی

**سووتن** / sûtin/: ☜ **سووتان**

**سووتوساز** / sût û saz/: نـاو. *[ژینناسـی]* ڕەوتی فیزیایی و کیمیاوی ژینـەوەر کـە مـاکی بژیـوی وەردەگرێ، تێکەڵی دەکا، لێکی دەدا و دەیکاتـە وزەی ژیان 🇮🇷 متابولیسم

**سووتوو** / sûtû/: ☜ **سووتک**

**سوته**[1] / sûte/: ☜ **سوتاو**

**ـ سوته**[2]: پاشەوشە. سووتاندوو؛ سووزاندگ ‹ویشکەڵی تاوسووتە شەمچێکی بەسە/ کۆنەکۆخێکی بەچرپیمان تەنی «حەقیقی»› ▤ ـ سوختە

**سوتەبا** / sûteba/: ناو. سەبوون؛ سەموون؛ گڕەبا ▤ باد سام

**سوتەڕۆک** / sûteřok/: ناو. مەزرای سووتاو ▤ مزرعەی سوختە

**سوتەکە** / sûteke/: ناو. گیایەکە دە ناو ژاژی دەکرێ ▤ گیاهی است با شیراز آمیزند

**سوتەڵ** / sûteł/: ☜ **سۆتك**

**سوتەمەرو** / sûtemerû/: ناو. داری تێکوڵ بە ئاگر هەڵپرووزاو ▤ چوب نیم‌سوختە

**سوتەمەنی**[1] / sûtemenî/: ناو. سووتەنی؛ شەوتک؛ ئاوردوو؛ کلە؛ ماکێ کە لە سووتانی، گەرما یان وزە بەرهەم دێ ▤ سوخت

**سوتەمەنی**[2]: ئاوەڵناو. تایبەت بۆ سووتان ‹لە مەکتەب سیاسییەوە بیست‌وشەش وانێت داری سووتەمەنی بۆ بنکەی چاپخانە و سی‌ودوو وانێت بۆ بنکەی ڕادیۆ هاتبوو «هەژار، چێشتی مجێور»› ▤ سوختنی

**سوتەنی**[1] / sûtenî/: ناو. ١. ☜ **سوتەمەنی**[1] ٢. هەر شتێ کە بسووتێ ▤ ١. ☜ **سوتەمەنی**[1] ٢. اشیاء سوختنی

**سوتەنی**[2]: ئاوەڵناو. لەبار بۆ سووتان ▤ سوختنی

**سوتیاگ** / sûtyag/: ☜ **سوتاو**

**سوتیان**[1] / sûtyan/: ☜ **سوتان**

**سوتیان**[2]: ناو. مەمکبەند؛ مەمکەڵبەست ▤ پستان‌بند

**سوتیانەوە** / sûtyanewe/: ☜ **سوتانەوە**

**ـ سوتێن** / -sûtên/: پاشەوشە. سووتێنەر ‹دەس‌سووتێن› ▤ سوزانندە

**سوتێنەر** / sûtêner/: ئاوەڵناو. بە تایبەتمەندی سووتاندنەوە ‹بە هەر بۆمبای سووتێنەرێک/ پێشمەرگەیەک، داری چاکێک، دانەقرچێ «سوارە»› ▤ سوزانندە

**سوجگەر** / sûcger/: ناو. سویجگەر؛ سووجەرگ؛ سی‌وجگەر؛ سی و جەرگ و دڵ و گورچیلەی ئاژەڵ بۆ برژاندن و لێنان ▤ دل و جگر و قلوە

**سوجەرگ** / sûcerg/: ☜ **سوجگەر**

**سوچ** / sûç/: ناو. ١. تاوان؛ هەڵە؛ خەتا ‹بۆچی تانەم لێ ئەدەی، سووچ و گوناهی من چییە؟/ خوا منی پابەندی داوی پەرچەمی تۆ کردووە «کەمالی»› ٢. سوچ؛ قوژبن؛ کونج؛ گۆشە ‹پەڵەهەورێکی چلکنە، گرتی سووچێکی ئاسمان/ گەڵای زەردی دارێک وەری، زریان بردی بەرەو نەمان «هێمن»› ▤ ١. گُناه ٢. گوشه

**سوچان** / sûçan/: ☜ **سوتان**

**سوچبار** / sûçbar/: ئاوەڵناو. سووچدار؛ خەتاکار؛ تاوانبار ▤ گُناهکار

**سوچدار** / sûçdar/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **سوچبار** ٢. قولینچکدار؛ بەگۆشە ▤ ١. ☜ **سوچبار** ٢. گوشەدار

**سوچنای** / sûçnay/: ☜ **سوتان**

**سوچەر** / sûçer/: ☜ **سوچەڕ**

**سوچەڕ** / sûçeř/: ناو. سووچەر؛ سیچڕ؛ سیچەڕ؛ سیخور؛ گیانەوەرێکی گوهانداری شەوگەڕە، بە درێژی میترێک و بە ڕەنگی قاوەیی کە سەرپشتی بە دڕکی درێژ و تیژ داپۆشراوە ▤ تشی؛ گربەتیغی

**سوچیای** / sûçyay/: چاوگ. سووتان ▤ سوختن

**سوخ** / sûx/: ناو. سووخار؛ سیخ؛ سیخار؛ خووس؛ خویز؛ ئاڵشت؛ زوقم ▤ پڕ؛ سرماریزە

**سوخار** / sûxar/: ☜ **سوخ**

**سوخت** / sûxt/: ناو. سووتەمەنی؛ ئاوردوو ▤ سوخت

**سوخوەر / sûx(i)wer/:** ☜ **سوتخوەر**

**سوخۆر / sûxor/:** ☜ **سوتخۆر**

**سوخەت / sûxet/:** ناو. ئاکار؛ خوو؛ ڕەوشت ☰ اخلاق

**سود / sûd/:** ناو. قازانج: ١. سووت؛ قازانجی قەرز ٢. قازانجی سەودا ٣. کەڵک؛ فێدە ☰ ١. ربا؛ بهره ٢. سود معامله ٣. فایده

**سودپەرست / sûdperist/:** ئاوەڵناو. سووپەرەست؛ هەلپەرست؛ لە دووی قازانج و سوودی خۆ، بەبێ ڕەچاو کردنی سوود و زیانی خەڵک ‹چ ناپیاون ئەوانەی سوودپەرستن/ دژی خاوەن دڵی شەیدا دەوەستن «هێمن»› ☰ اخلاق

**سودخۆر / sûdxor/:** ☜ **سوتخۆر**

**سوددار / sûddar/:** ئاوەڵناو. بەهرەدەر؛ بە قازانج ☰ مُفید

**سودمەند / sûdmend/:** ئاوەڵناو. بەکار؛ بەکەڵک ☰ بەدردبخور

**سور[1] / sûr/:** ناو. سوویر: ١. سۆر؛ سوهر؛ قرمز؛ لە ڕەنگە سەرەکییەکان وەک ڕەنگی خوێن ٢. بەزم؛ میوانی؛ مێمانی ‹سوور دان› ٣. دیواری دەوری باخ ٤. کۆی گەنم لە خەرمان ٥. دەستەواژەیەک لە پاسووردا ☰ ١. سُرخ ٢. مهمانی ٣. دیوار پیرامون باغ ۴. تودەی گندم در خرمن ۵. اصطلاحی در بازی ورق

⊡ **خەرمان سور بون:** جیا بوونەوەی کا لە دان و دەرکەوتنی زۆرینەی دان. هەروەها: **سوور کردنی خەرمان** ☰ جدا شدن کاه از دانه در خرمن

**سور[2]:** ئاوەڵناو. سوویر: ١. سۆر؛ سوهر؛ قرمز؛ بە ڕەنگی خوێن ٢. پرخوێ؛ سوێر؛ سوڵ؛ شۆر ٣. سوویر؛ بەتین؛ داخ ٤. ئاشکرا؛ دیار ‹لێمان سوور و ئاشکرا بوو، دیتەوە› ٥. *[مەجاز]* پێچەقێن؛ پێداگر ‹دەمگرێ، ئەمما لە گرتووخانە ڕقئەستوورترم/ لێمدەدا، ئەمما لە سەر داوا ڕەواکەم سوورترم «هێمن»› ٦. *[مەجاز]* خوێنین؛ خوێناوی ٧. *[مەجاز]* کومۆنیست؛ شیوعی ☰ ١. سُرخ ٢. شور ٣. داغ ۴. آشکارا ۵. مُصر ۶. خونین ۷. کمونیست

⊡ **سوری دوگر:** *[کینایە]* کەسێ کە دوو شتی ناتەبای پێکەوە دەوێ ‹بۆتە سووری دووگر، هەم خوای دەوێ هەم خورما!› ☰ آن کە دو چیز متضاد را با هم می‌خواهد

⊡ **سور بون:** ١. ڕەنگی سوور گرتنە خۆ ٢. *[مەجاز]* چەقین و پێداگرتن لە سەر کارێ ☰ ١. سرخرنگ شدن ٢. اصرار ورزیدن

**سور بونەوە:** سوورەو/ سوورەوە بوون: ١. سوور سوور هەڵگەڕانی کانزا بە تینی ئاگر ٢. *[مەجاز]* سوور داگەڕان؛ لە بەر حەیا و شەرم یا تووڕەیی سوور هەڵگەڕان ٣. لە ناو ڕۆنا چزان ٤. *[مەجاز]* ڕوون بوونەوەی مەبەست ☰ ١. گداختن ٢. سُرخ شدن از شرم یا از خشم ٣. در روغن سُرخ شدن ۴. روشن شدن موضوع

**سور داگەڕان:** *[مەجاز]* سوور داگەڕیان؛ سوور داگیرسان؛ لە شەرمان سوورەوە بوون ☰ از شرم سُرخ شدن

**سور داگەڕیان:** ☜ **سور داگەڕان**

**سور داگیرسان:** ☜ **سور داگەڕان**

**سور کردن:** ١. بە ڕەنگی سوور ڕەنگاندن ٢. دەستەواژەیەک لە پاسووردا ☰ ١. سرخ رنگ کردن ٢. اصطلاحی در بازی ورق

**سور کردنەوە:** سوورۆ کردن: ١. لە ڕۆندا چزاندن ٢. کانزا بە تینی ئاگر سوور هەڵگەڕاندن ٣. *[مەجاز]* ئاشکرا کردن؛ دەرخستنی مەبەست ☰ ١. سرخ کردن در روغن ٢. گداختن فلز ٣. آشکار کردن مطلب

**سورەو بون:** ☜ **سور بونەوە**

**سورەوە بون:** ☜ **سور بونەوە**

**سور هەڵگەڕان:** سوور هەڵگێران: ١. بە ڕەنگی

سـوور دەرهـاتن ۲. [مەجاز] سـوور داگـەڕان؛ سوورەوە بوون لە شەرمان ۳. [کینایە] زۆر تووڕە بوون ☰ ۱. به رنگ سرخ درآمدن ۲. سُرخ شدن از شرم ۳. خشمگین شدن

**سور هەڵگێڕان**: ☚ **سور هەڵگەڕان**

**سورۆ کردن**: ☚ **سور کردنەوە**

**سور²**: ئاوەڵکار. سـووێر: ۱. ڕەپ و ڕاسـت ‹سـوور پێـی گـوت درۆ دەکـەی!› ۲. بـە دڵـنیاییەوە ‹تفەنگێکم لێ تەقاند، سـوور دەمـزانی نەمهـەنگاوت؛ بەلام هێندێک لە هەوالان گوتیان کوشتت! «هـەژار، چێشتی مجێور»› ☰ ۱. رُک و صریح ۲. با اطمینان

**سوراڤک / sûravik/**: ☚ **سوراو ـ۱**

**ـ سـوران / sûran-/**: پاشەوشـە. سـوورانە گـرتن؛ میوانی دان ‹خەتەنەسووران› ☰ ـ سوران

**سورانچک / sûrançik/**: ☚ **سورێنچك**

**سورانە / sûrane/**: نـاو. ۱. میوانـداری بـە هـۆی خەرمان هەڵگرتن ‹سوورانەی خەرمان› ۲. دیاری ڕەعیەت بۆ ئاغا بە هۆی ژن هێنانەوە ‹ڕاستم پـێ بلێ بەبێ بەهانە/ بۆ سوورانەی ژن یـا خـود پووشـانە «قـانع»› ۳. کیلەیـەک لـە هـەر بنەتۆیـەک لـە خەرمان کە بۆ ئاغا دەچوو ☰ ۱. جشن و سور جمع کردن خرمن ۲. هدیەی داماد رعیت بـرای اربـاب ۳. بذر هدیه به ارباب

**سوراو¹ / sûraw/**: نـاو. ۱. سووراڤـک؛ دەرمانـێ سوور کە ژنان بۆ جوانی لە گۆنایان هەڵدەسـوون ۲. جـۆرێ تـرێ سـوور ۳. ☚ **سـورەبنـە** ٤. خوێ‌واوک؛ ئاوی سوێر ٥. گوڵی پۆپەکەڵەشـێرە ☰ ۱. سُرخاب ۲. نوعی انگور قرمز ۳. ☚ **سورەبنە** ۴. آب نمک ۵. گُل تاج‌خروس

**سوراو²**: ئاوەڵناو. سواو ☰ سایيده

**سوراوسپیاو / sûraws(i)pîaw/**: نـاو. دەرمانی خـۆ جوان کردن ☰ سُرخاب و سفیداب

◘ **سوراوسپیاو کردن**: [کینایە] خۆ جـوان کـردن ☰ آرایش کردن

**سوراوە / sûrawe/**: ئاوەڵناو. ۱. سواو؛ سـاویاگ ۲. کون‌کراو ☰ ۱. سایيده ۲. سوراخ شده

**سورایەتی / sûrayetî/**: ☚ **سوری**

**سورایی / sûrayî/**: ☚ **سوری**

**سورباش / sûrbaş/**: نـاو. کـارگوزار؛ فـەرمانگوزار؛ زاوت ☰ کارگُزار

**سورباو / sûrbaw/**: ئاوەڵـناو. سوورکار؛ سـوورکارە؛ بە ڕەنگی ئاماڵ‌سوور ☰ مایل به سرخ

**سوربلەتی / sûrb(i)letî/**: نـاو. گـوێژی سـوور ☰ زالزالک قرمز

**سوربۆرە / sûrbore/**: ئاوەڵـناو. بـۆری خـاڵ سـوور (ئەسپ) ☰ بورِ خال قرمز (اسب)

**سوربۆز / sûrboz/**: ئاوەڵـناو. سـپی خـاڵ سـوور (ئەسپ) ☰ سفید خال قرمز (اسب)

**سوربۆوە / sûrbowe/**: ئاوەڵـناو. سـۆرەوبوو: ۱. سوورکراو لە کوورەدا ۲. چزاو لە ڕۆندا ☰ ۱. سُرخ شده در کوره ۲. سُرخ شده در روغن

**سوربەسور / sûrbesûr/**: ئاوەڵکار. ڕاشـکاوانە؛ بـە ئاشکرا و ڕەپ و ڕاست ☰ به صراحت

**سوربەڵەک / sûrbełek/**: ئاوەڵناو. سـووری خـاڵ سپی ☰ قرمز با خال سفید

**سورپڕنۆڵ / sûrpiřnoł/**: ئاوەڵناو. دەموچاو سووری ناحەز ☰ سرخ رنگ بدقیافه

**سورپیاز / sûrp(i)yaz/**: نـاو. ژەنگەسـوورە؛ زەنگەسوورە؛ سوورەمۆزە ☰ زنبور درشت سرخ

**سورپێست / sûrpêst/**: ئاوەڵناو. سۆرپێست؛ سەر بە یەکێک لە چوارگرۆی گـەورەی ڕەگـەزی مـرۆ، خەڵـکی قورنـەی ئـەمریکا و دوورگـەکانی ئوقیانووسی ئارام، بە پێستی قاوەیی ڕۆشـنەوە ☰ سُرخپوست

**سورچک / sûrçik/**: ☚ **سورێنچك**

**سورخون / sûrxun/**: ئاوەڵناو. سـووری ئـاچخ بـە

پەڵەی سپییەوە ☰ سرخ روشن با لکەهای سفید

**سورخول** / sûrxûl/: ئاوەڵناو. سوورفل؛ سوورهول؛ موو زەردی ناحەز ☰ موزرد بدقیافه

**سورخەزاڵ** / sûrxezał/: ئاوەڵناو. سووری پڵ ـ پڵ ☰ سرخ رنگ لکه ـ لکه

**سورسات** / sûrsat/: ☜ **سیورسات**

**سورسنەیی** / sûrs(i)neyî/: ناو. جۆرێ ترێ ☰ نوعی انگور

**سورشامی** / sûrşamî/: ناو. جۆرێ ترێ ☰ نوعی انگور

**سورفل** / sûrfil/: ☜ **سورخول**

**سورقوچ** / sûrqûç/: ناو. گوڵینگی بەران ڕازاندنەوە کە لە سەرەکلکی سپی بڕاوی ڕەشەماڵ بۆی سوور دەکرا ☰ نوعی منگولەی زینتی برای قوچ

**سورک** / sûrik/: ناو. مۆرانە؛ مخورکە؛ موڕ ☰ موریانه

**سورکار** / sûrkar/: ☜ **سورباو**

**سورکارە** / sûrkare/: ☜ **سورباو**

**سورکاڵ**[1] / sûrkał/: ناو. ڕەنگی پەمەیی ئاماڵ سوور ☰ رنگ سُرخابی

**سورکاڵ**[2]: ئاوەڵناو. بە ڕەنگی چێرەیی ئاماڵ سوور ☰ سُرخابی رنگ

**سورکراوە** / sûrk(i)rawe/: ئاوەڵناو. سوورکراوەوە؛ سوورەوەبووگ؛ سوورەوکریاگ؛ سوورەوەکراو: ١. لە کوورەدا سوور بۆوە ٢. لە ڕۆندا چزاو ☰ ١. مُلتهب در کوره ٢. سُرخ شده در روغن

**سورکراوەوە** / sûrk(i)rawewe/: ☜ **سورکراوە**

**سورکوێت** / sûrk(i)wêt/: ئاوەڵناو. کوێتی ڕەنگ ئاچخ (ئەسپ) ☰ کُمیت روشن (اسب)

**سورکە**[1] / sûrke/: ناو. ١. ☜ **سوریجە** ٢. سۆرک؛ هەرزن ٣. جۆرێ مێوژ؛ مێوژەسوورکە ☰ ١. ☜ **سوریجه** ٢. ارزن ٣. نوعی کشمش

**سورکە**[2]: ئاوەڵناو. چکۆلەی سوور ☰ سُرخ‌فام کوچک

**سورکەلە** / sûrkele/: ☜ **سورکەڵە**

**سورکەڵە** / sûrkełe/: ئاوەڵناو. سوورکەلە؛ ڕەنگ‌سووری چکۆلە ☰ کوچولوی سرخ فام

**سورکەوگ** / sûrkewig/: ئاوەڵناو. سووری ئاماڵ‌شین ☰ سرخ رنگ کبودفام

**سورکێ** / sûrkê/: ☜ **سوریجه**

**سورگوڵ** / sûrguł/: ناو. ١. ☜ **سورەگوڵ** ٢. جۆرێ گەنم ٣. *[مەجاز]* ژنی زۆر جوان ☰ ١. ☜ **سورەگوڵ** ٢. نوعی گندم ٣. زن بسیار زیبا

**سورگوم** / sûrgum/: ئاوەڵناو. وندابووی بێ‌سەر و شوێن ☰ گمشده‌ی بی‌نشان و اثر

**سورلام** / sûrlam/: ئاوەڵناو. دەم‌وڕوو سوور؛ ڕوخسار بە ڕەنگی سوورکارە ☰ سرخ‌روی

**سورم** / sûrim/: ناو. حیش؛ زەوینی گڵەسوورە ☰ زمین گِل سُرخ

**سورماڵک** / sûrmałik/: ناو. سوورمەن؛ سوورەبانوو؛ زەوی گڵەسوورەی بێ‌خێز ☰ زمین رُسی

**سورمل** / sûrmil/: ناو. هێڵی سەر کێو ☰ خط‌الرأس

**سورمەن** / sûrmen/: ☜ **سورماڵك**

**سورنجان** / sûrincan/: ناو. گوڵەگەزیزە؛ گوڵەئاوەنیا؛ گوڵەجووتیار؛ گوڵەجووتێرە؛ جووتیارۆک؛ گوڵەعەزرەتی؛ گوڵەخەیارک؛ گوڵەپاییزە؛ بەنگلەژیلە؛ بکێڵومەکێڵ؛ بکێڵیەی‌پاییز؛ پیازی هوورچ؛ زەعفەرانی مێرگ؛ سووریجان؛ گیایەکی ئالیکی گۆشتن و سەلک‌دارە بە گەڵای درێژ و باریک و نووک‌تیژ و بێ‌کولکەوە، بە ڕەنگی سەوزی تۆخ، گوڵی بنەوش و بەری کەپسوولی دەنک زۆر، کە گوڵ و سەلک و دانەکەی بۆ دەرمان دەبن ☰ سورنجان

**سورنجە** / sûrince/: ☜ **سوریجه**

**سوورۆنه** / sûrone/: ☜ **سوورەبنه**

**سووره**[۱] / sûre/: ناوەڵناو. چرچاو سوور ☫ سُرخروی

**سووره**[۲]: پێشوشە. سوور؛ ڕەنگسوور (سوورەکەرویشک) ☫ سُرخفام

**سوورەبا** / sûreba/: ☜ **بای سوور**

**سوورەباڵه** / sûrebałe/: ☜ **زڕەکەو**

**سوورەبانو** / sûrebanû/: ☜ **سوورماڵك**

**سوورەبنه** / sûreb(i)ne/: ناو. سووراو؛ سوورەونه؛ سوورۆنه؛ گیایەکه بۆ دۆکلیو ☫ گیاهی است در دوغبا کنند

**سوورەبی** / sûrebî/: ناو. جۆرێ دار بی ☫ نوعی بید

**سوورەپنگ** / sûreping/: ناو. پنگەسووره ☫ نوعی پونه

**سوورەت** / sûret/: ناو. لیست؛ سیایی؛ سوورەت ☫ لیست

**سوورەتا** / sûreta/: ناو. ۱. تای سێ ڕۆژه؛ نۆبەتێ که سێ ڕۆژ نەخۆش بەر نادا ۲. پەتایەکی چلکی مندالانی ۳ تا ۷ ساله، زیاتر له وەرزه ساردەکاندا سەر هەڵدەدا، نیشانەکانی بریتین له: ئێش و کزەی ناو قورگ، تای ۳۸ پله و ژوورتر و هەڵبزرکانی پێستی بن‌باڵ، مل، پشت گوێ و سینگ و پاشان تەواو لەش ☫ ۱. تب سه روزه ۲. مخملک

**سوورەتاو** / sûretaw/: ناو. گەرمای بەتەوژمی خۆر ☫ هُرم آفتاب

**سوورەتو** / sûretû/: ناو. ڕەشەتوو؛ شاتوو؛ گاتوو ☫ شاه‌توت

**سوورەتی** / sûretî/: ناو. پەمبەیی؛ گوڵی؛ چێرەیی؛ ڕەنگی سووری کاڵ ☫ صورتی

**سوورەچنار** / sureç(i)nar/: ناو. چناری جەوهەردار ☫ چنار

**سوورەچیغ** / sureçîğ/: ناو. جۆرێ چیغه، هەوارچییان له قامیش دروستی دەکەن ☫ پرچین نی

**سوورەچێو** / sureçêw/: ناو. جۆرێ دەوەنەداره ☫ درختچه‌ای است

**سوورەداڵ** / sûredał/: ناو. سوورەواڵه؛ پیرۆزه ☫ هُما

**سوورەدەمار** / sûredemar/: ناو. خوێنبەر؛ ڕەگی خوێن ڕاگوێزان له دڵەوه بۆ ئەندامان ☫ سُرخرگ

**سوورەزرته** / sûrezirte/: ناوەڵناو. [پلار] مووزەردی چاوشینی ناحەز ☫ مو زرد چشم آبی بدقواره

**سوورەزەڕینه** / sûrezeřîne/: ناو. کۆلکەزێڕینه؛ پەلکەڕەنگینه ☫ رنگین‌کمان

**سوورەساقه** / sûresaqe/: ناو. سوورەسەقەته؛ سوورەقەته؛ بێچووه چێشکەی هێشتا تووک لێ نەهاتوو ☫ جوجه‌ی هنوز پر درنیاورده

**سوورەساو** / sûresaw/: ناو. سێوه سووره ☫ سیب سُرخ

**سوورەسەقەته** / sûreseqete/: ☜ **سوورەساقه**

**سوورەشامی** / sureşamî/: ناو. جۆرێ ترێ ☫ نوعی انگور

**سوورەقانگ** / sûreqang/: ناو. سووراویلک؛ سوورەپەن؛ سوورەمراوی؛ کەرزەر؛ کەرسەڕ؛ مزراح؛ باڵندەیەکه له تیرەی قاز مراوی، له تۆرەمەی وەردۆک، ٦٠ سانتی‌میتر دەبێ، سووری خەنەییه، دووچکه، سەرباڵ، لاق و دەنووکی ڕەشه، نێرەیان تۆقی ڕەشی بە ملدا هاتووه، مێکەیان سەری مەیلەو سپییه، به جووت دەگەڕێن، له خێزەلانی پاڵ چۆم و گۆل دەبینرێ، له کون و قەڵشته بەردان هێلانه ساز دەکا، کۆچەرییه، جووچکەکانی بۆ ناو ئاو دەگوێزێتەوه ☫ أنقوت

**سوورەقورینگ** / sûrequrîng/: ناو. سوورەقولەنگ؛ قازی سوور؛ کەرنگ: ۱. ناوی گشتی تۆرەمەیەکی باڵندەیەکه، له گۆلی ورمێ زۆره،

ڕەوەی سوورەقورینگ لە دوورەوە سوور دەنوێنێ ٢. باڵندەیەکە لە تۆرەمەی سوورەقورینگ، نزیک ١٥٠ سانتیمیترە، لاقی زۆر درێژ، تـووکی سـپی، ژێر باڵی سوور و دەنووکی قوڵنگییە، بـە هـێمنی هەنگاو دەنێ، سەر لە ئاو ڕۆ دەکا بۆ خواردن، لـە ڕووتەنی قەراغ ئاوی سـوێر قـوڕ کـۆ دەکاتـەوە و دەیکا بـە هێلانـە و یـەک هێلکـەی تـێ دەکـا. بەنـداو، زەل، گـۆل و گـۆلاو جـێ ژیـانی ئـەم باڵـندەیە و بـە پـۆل دەگـەڕێن ☰ ١. راسـتەی فلامینگو ٢. فلامینگو

**سورەقوڵنگ** / sûrequłing/: ☜ **سورەقورینگ**

**سورەقەتە**[١] / sûreqete/: ☜ **سورەساقە**

**سورەقەتە**[٢]: ئاوەڵناو. پاخلێر؛ لە بنەوە تاشراو «ئـەو کوڕە سەر سوورەقەتە کێیە؟». هەروەها: **سوورەقەتە کردن** ☰ از بیخ تراشیده

**سورەکوان** / sûrek(i)wan/: نـاو. جـۆرێ زیپکـەی گەورەی سەرسوورە ☰ نوعی جوش بزرگ

**سورەکەروێشک** / sûrekerwêşk/: نـــــــاو. سوورەکەوریشـک؛ کەروێشـکی سـوورباو ☰ خرگوش سُرخفام

**سورەکەوا** / sûrekewa/: نـاو. کاسەڵەشـینکە ☰ سبزقبا

**سـورەکـەوریشـک** / sûrekewrêşk/: ☜ **سورەکەروێشك**

**سورەگوڵ** / sûreguł/: نـاو. سـۆرگول؛ سـۆرگول؛ سۆرەگول؛ سوورگول؛ گولی سوور ☰ گُل سُرخ

**سورەگوێنی** / sûreg(i)wênî/: ناو. جۆرێ گـەوەنی مەیلەو سوور ☰ گَوَن سُرخ

**سـورەگـەوِن** / sûregewin/: نـاو. سـوورەگەوەن؛ ژیژەڵە؛ جۆرێ گۆینی مەیلەو سوورە ☰ گَوَن سُرخ

**سورەگەوەن** / sûregewen/: ☜ **سورەگەون**

**سورەماسی** / sûremasî/: ناو. قاشە؛ جۆرێ ماسـی ☰ شبوط؛ نوعی ماهی

**سورەمراوی** / sûrem(i)rawî/: ☜ **سورەقانگ**

**سورەمۆز** / sûremoz/: ☜ **سیرەمۆزە**

**سورەمۆزە** / sûremoze/: ☜ **سیرەمۆزە**

**سورەواڵە** / sûrewałe/: ☜ **سورەداڵ**

**سورەوکریاگ** / sûrewkiryag/: ☜ **سورکراوە**

**سورەونە** / sûrew(i)ne/: ☜ **سورەبنە**

**سورەوەبوگ** / sûrewebûg/: ☜ **سورکراوە**

**سورەوەکراو** / sûrewek(i)raw/: ☜ **سورکراوە**

**سـورەهەراڵە** / sûreherałe/: نـاو. گیایـــەکی بۆنخۆشـە «سوورەهەراڵـە و دەوروو هـەوارا/ هـەر هەیشوور وەشا، گوزەرگاو یارا «فولکلۆر»» ☰ شـقایق نُعمان

**سورەیاو** / sûreyaw/: ناو. گرانەتا ☰ تیفوئید

**سورەییا** / sûreyya/: ناو. پێـروو؛ ئەسـتێرەی کـۆ؛ ئەستێرە شەشـانەکەی ئاسمـان ☰ حشـرەای کـە چشم دام را کور می‌کند

**سورهول** / sûrhul/: ☜ **سورخول**

**سـورهەڵگـەڕاو** / sûrehełgeřaw/: ئاوەڵـــناو. ١. سـووربۆوە لـە شـەرمان ٢. بـە ڕەنگـی سـوور دەرهاتوو ٣. وەڕەز؛ تووڕە ☰ ١. سرخ‌شـدە از شـرم ٢. به رنگ سرخ درآمده ٣. خشمگین

**سوری** / sûrî/: ناو. سۆهری؛ سوورایەتی؛ سوورایی؛ سووریەتی؛ سوورێتی؛ سووراتی ☰ سُرخی

**سوریجان** / sûrîcan/: ☜ **سورنجان**

**سـوریجە** / sûrîce/: نـاو. سـوورنجە؛ سـورک؛ سوهرک؛ سۆرک؛ سوێرێژک؛ سوورکە؛ سـوورکێ؛ سـووریک؛ سـووریکە؛ سـووریجە؛ سـوورێژە؛ سـوورێژکە؛ سـووریکە؛ گەزنـــە؛ ئەســـپە؛ نەخۆشییەکی زۆر ئاسـتەمی ویرووسـییە کـە بـە یاوێکی تووش، زیپکە و ئاوەچۆڕەوە سەر هەڵدەدا و لە منداڵاندا زۆر گیرۆیە ☰ سُرخک

**سوریک** / sûrîk/: ☜ **سوریجە**

**سوریکە** / sûrîke/: ☜ **سوریجە**

**سوریەتی / sûryetî/:** ☜ **سوری**

**سورێتی / sûrêtî/:** ☜ **سوری**

**سورێچە / sûrêce/:** ☜ **سوریچە**

**سورێچکە / sûrreçke/:** ☜ **سورێنچك**

**سورێژکە / sûrêjke/:** ☜ **سوریچە**

**سورێژە / sûrêje/:** ☜ **سوریچە**

**سورێکە / sûrêke/:** ☜ **سوریچە**

**سورێنچک / sûrênçik/:** ناو. سوورێنچک؛ سوهریچک؛ سوورانچک؛ سوورچک؛ سوورێچکە؛ سوورێنچکە؛ سوورێنە؛ سێرۆچکە؛ قوریژنگ؛ زەنگلۆک؛ ئەندامێکە لە لەشی بڕبڕەداراندا کە ئاو و خۆراک لە گەرووەوە دەبا بۆ گەدە، نزیک بە ٢٥ سانتیمیترە ☰ سُرخنای؛ مری

**سورێنچکە / sûrênçke/:** ☜ **سورێنچك**

**سورێنە / sûrêne/:** ☜ **سورێنچك**

**سوڕ[١] / sûř/:** ناو. خول؛ ڕەوتی زڤرین ☰ چرخش

▣ **سوڕی مانگانە:** خوێنی مانگانە؛ سەرخوێن؛ بێنوێژی؛ مەهیک؛ مانگانە؛ بریتییە لە ڕژانی مانگانەی خوێن لە ڕەگەزی مێیینەی تاقمێک لە گوانداران، کە لە سەرەتای پێگەیشتنەوە دەست پێ دەکا و تا ئاوەسۆیی بەردەوام دەبێ ☰ قاعدگی

▣ **سوڕ خواردن:** خول خواردن؛ گەڕیان ☰ چرخیدن؛ گردیدن

**سوڕ دان:** ١. خول خواردن ٢. خول (پێ)دان ٣. [کنایە] سەما و ڕەقس کردن ٤. تووڕ دان؛ ئاویتن ☰ ١. چرخیدن ٢. چرخاندن ٣. رقصیدن ۴. پرت کردن

• **سوڕ[٢]:** پاشەوشە. ـ سووڕێن ☰ ـ گرد

**سوڕان / sûřan/:** چاوگ. سووڕیان؛ زڤرین؛ سووڕیای؛ خول خواردن ☰ چرخیدن

**سوڕاندن / sûřandin/:** چاوگ. سووڕانن؛ سووڕنای؛ چەرخاندن؛ زڤراندن؛ خول پێ دان ☰ چرخاندن

**سوڕاندنەوە / sûřand(i)newe/:** چاوگ. تێپەڕ. //سووڕاندتەوە؛ دەسووڕێنییەوە؛ بسووڕێنەوە// سووڕاننەوە؛ سووڕنایوە؛ سووڕنایۆ؛ گەشت پێ کردن؛ گەڕاندن ☰ چرخانیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـــ/ چاوگی نەرێنی: نەسووڕاندنەوە

**سوڕانن / sûřanin/:** ☜ **سوڕاندن**

**سوڕاننەوە / sûřannewe/:** ☜ **سوڕاندنەوە**

**سوڕانەوە / sûřanewe/:** چاوگ. تێنەپەڕ. //سووڕایەوە؛ دەسووڕێیەوە؛ بسووڕێوە// سووڕیانەوە؛ سووڕیایوە؛ سووڕیایۆ: ١. خول خواردن ٢. گەڕان بەولاولادا ☰ ١. چرخیدن ٢. گردش کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: سووڕاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەسووڕانەوە

**سوڕک / sûř(i)k/:** ناو. جوڕنە؛ حەوزۆکەی تاکەکەسی لە گەرماودا ☰ حوضچەی یک نفره در گرمابه

**سوڕنای / sûřnay/:** ☜ **سوڕاندن**

**سوڕنایوە / sûřnaywe/:** ☜ **سوڕاندنەوە**

**سوڕنایۆ / sûřnayo/:** ☜ **سوڕاندنەوە**

**سوڕە / sûře/:** ناو. سووڕ؛ خول؛ چەرخ ☰ چرخش

**سوڕەت / sûřet/:** ناو. ١. سوورە؛ بەندێ لە قورعان ٢. چارەگە لیرە ٣. سیایی؛ لیست ☰ ١. سورەی قرآن ٢. رُبع سکەی طلا ٣. سیاهە

**سوڕیان / sûřyan/:** ☜ **سوڕان**

**سوڕیانەوە / sûřyanewe/:** ☜ **سوڕانەوە**

**سوڕیای / sûřyay/:** ☜ **سوڕان**

**سوڕیایوە / sûřyaywe/:** ☜ **سوڕانەوە**

**سوڕیایۆ / sûřyayo/:** ☜ **سوڕانەوە**

**ـ سوڕێن / -sûřên/:** پاشەوشە. سووڕێنەر ‹سەرسووڕێن› ☰ چرخاننده

**سوڕێنەر / sûřêner/:** ئاوەڵناو. چەرخێنەر ☰ چرخاننده

**سوز** / sûz/: ناو. بوومەلێڵە؛ بوولێڵە؛ تاریک‌وروونی بەیانی ☰ گرگ‌ومیش اوّل بامداد

**سوزاک** / sûzak/: ناو. ئاتەشە ☰ سوزاک

**سوزان** / sûzan/: ☜ **سوتان**

**سوزاندن** / sûzandin/: ☜ **سوتاندن**

**سوزانن** / sûzanin/: ☜ **سوتاندن**

**سوزانەوە** / sûzanewe/: ☜ **سوتانەوە**

**سوزانی** / sûzanî/: ناوەڵناو. سۆزانی؛ سووزمانی؛ سۆزمانی؛ ژنی بێ‌شەرم و حەیا ‹بێ‌حەیان جوملە خسوسەن ژنە سووزانییەکەی! «شێخ ڕەزا»› ☰ سلیطه؛ بی‌حیا

**سوزمانی** / sûzmanî/: ☜ **سوزانی**

**سوزمە** / sûzme/: ناو. ١. سماق‌پالانی؛ برنج‌پاڵێوی کانزا ٢. چێشتی ماش و برنج ☰ ١. آبکش فلزی ٢. آش ماش و برنج

**سوزن** / sûzin/: ناو. سووژن؛ دەرزی درێژ و ئەستوور بۆ جەواڵ دروون ☰ جوالدوز

**سوزنکوت** / sûzinkut/: ☜ **سوژن‌ئاژن**

**سوزنە** / sûzne/: ناوەڵناو. سووتێن ☰ سوزاننده

**سوزەنەک** / sûzenek/: ناو. سووسەنەک؛ نەخۆشییەکە لە شەرمی نێر و مێ پەیدا دەبێ ☰ سوزاک

**سوزەنی** / sûzenî/: ناو. جۆرێ قوماشە ☰ پارچەای است

**سوزیاگ** / sûzyag/: ☜ **سوتاو**

**سوزیان** / sûzyan/: ☜ **سوتان**

**سوزیانەوە** / sûzyanewe/: ☜ **سۆڵیانەوە**

**سوزیاو** / sûzyaw/: ☜ **سوتاو**

**سوژاندن** / sûjandin/: ☜ **سوتاندن**

**سوژن** / sûjin/: ناو. ١. ☜ **سوزن** ٢. نەقیزە؛ زەختە ‹بەلام کەر جووتە ناهاوێ، کەرسوار/ سووژن لە ملی نەدا جار و بار «گۆران»› ☰ ١. ☜ **سوزن** ٢. سیخونک

⊡ **سوژن بە دز پێ کردن**: [کنایە] شاردنەوەی مەسەلەیەک لە نێوان چەن کەسدا ‹وایان سووژن بە دز پێ کرد، تازە کەس بە ڕاست و درۆی نازانێ!› ☰ مخفی کردن چیزی میان چند نفر

**سوژن‌ئاژن** / sûjin'ajin/: ناو. سووزن‌کوت؛ کاری بە سووژن کون- کون کردن ☰ عمل با جوالدوز سوراخ ـ سوراخ کردن

**سوژناژن** / sûj(i)najin/: ☜ **شوژناژن**

**سوژندان** / sûjandin/: ناو. کیسۆکەی چەرمین بۆ جێ سووژن ☰ کیسەی چرمی جای جوالدوز

**سوژە** / sûje/: ناو. مژاد؛ درگە؛ درخە؛ بابەت ☰ سوژه

**سوژیان** / sûjyan/: ☜ **سوتان**

**سوژیاو** / sûjyaw/: ☜ **سوتاو**

**سوسرەت** / sûsret/: ناوەڵناو. جەرگ‌هەڵێن؛ سەیر و سەمەرە ☰ عجیب

**سوسک** / sûsk/: ☜ **سوێسکە**

**سوسکە** / sûske/: ☜ **سوێسکە**

**سوسن** / sûsin/: ☜ **سوێسنە**

**سوسە** / sûse/: ☜ **سۆسە-١**

**سوسەلێ** / sûselê/: ناو. بزنی ڕەشی دەم و چاوسوور ☰ بُز مشکی سر قرمز

**سوسەمار** / sûsemar/: ناو. بزنمژ؛ بزنمژک؛ بزن‌چەکێنە؛ تیرتیرە؛ تێرتێرە؛ مارگیس؛ مارشێوک؛ هەر یەکە لە ئەندامانی ڕاستەی سووسماران ☰ سوسمار

**سوسەمبەر** / sûsember/: ناو. سووسەنبەر؛ سیسەنبەر؛ سیس‌عەمەر؛ سیس‌عەنبەر؛ جاترەمە؛ جاترەکێویلە؛ هەزبیلەکێویلە؛ چەشنێک جاترەی بۆنخۆش بە گوڵی سپی مەیلەو ئاڵ و گەڵای پان و ددانەدارەوە کە بۆ مەبەستی بژیشکی و بەهارات و عەترسازی بەکار دێت ☰ سوسنبر

**سوسەن** / sûsen/: ☜ **سوێسنە**

**سووسەنبەر / sûsenber/:** ☜ **سووسەمبەر**

**سووسەنەک / sûsenek/:** ☜ **سووزەنەك**

**سووسی / sûsî/:** ☜ **سوێسکە**

**سووسیال‌دیموکرات / sûsyaldîmukrat/:** ئاوەڵناو. ١. سەر بە سووسیال‌دیموکراسی ٢. لایەنگر و شوێنکەوتووی سووسیال‌دیموکراسی ☰ ١و٢. سوسیال‌دمکرات

**سووسیال‌دیموکراسی / sûsyaldîmukrasî/:** ناو. بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی هۆگری گۆڕانی کۆمەڵگا لە سەرمایەدارییەوە بۆ سووسیالیستی بە شێوەگەلی ئاشتی‌خوازانە و دیموکراتیک ☰ سوسیال‌دمکراسی

**سووسیالیست / sûsyalîst/:** ئاوەڵناو. لایەنگر و شوێنکەوتووی سووسیالیسم ☰ سوسیالیست

**سووسیالیستی / sûsyalîstî/:** ئاوەڵناو. سەر بە سووسیالیسم ☰ سوسیالیستی

**سووسیالیسم / sûsyalîsm/:** ناو. ١. ئامۆژەیەکی فەلسەفی کە بڕوای بە لاچوونی خاوەندارییەتی کەس بە سەر ئامێری بەرهەمهێنان و سەرمایەدارییە ٢. سیستەمێکی سیاسی کە بە پێودانی ئەم ئامۆژەیە پێکهاتووە ☰ ١و٢. سوسیالیسم

**سووش / sûş/:** ناو. گیایەکی بۆنخۆشە ☰ گیاهی خوشبو

**سووقان / sûqan/:** ☜ **ئێسك**

**سووک[1] / sûk/:** ناو. ١. بازاڕ؛ وازاڕ؛ بازێڕ؛ شوێنی مامەڵە ٢. *[شووره‌یی]* بز؛ کاری پەنجە بۆ کنگ بردن ٣. *[شووره‌یی]* حینچکە؛ کاری لە پشت ژەنین ٤. زەختە؛ نەقیزە ☰ ١. بازار ٢. انگُلک ٣. کلەی حین جماع ۴. سیخونک

⊡ **سووک پێوەدان:** *[شووره‌یی]* سۆک لێ دان؛ سۆک پێوە نان؛ سووک دان؛ خۆ پێوەنان؛ حینچکە لێ دان ☰ کله زدن حین مقاربت

**سووک پێوە کردن:** *[شووره‌یی]* بز پێوە کردن؛ ئەنگوست بۆ قنگ بردن ☰ انگُلک کردن

**سووک دان:** ☜ **سووك پێوەدان**

**سووک لێ نەوین:** سۆک لێ نەوین؛ بە سۆک زانین ☰ سبک و کم‌وزن انگاشتن

**سووک[2]:** ئاوەڵناو. سڤک: سۆک؛ سفک: ١. سووکەڵە؛ کەمۆکە؛ بە کێشی کەم ‹باری سووک› ٢. بە کێشی کەمتر لە هەندی پێویست یان ڕەچاوکراو ‹چوار کیلۆ شەکرم ساند، پێم سووک هاتە بەرچاو، کێشام سێ کیلۆ و نیو بوو!› ✱ بەرانبەر: **قورس** ٣. *[مەجاز]* مەراش و ناخۆش ‹ئاکاری سووک›. بەرانبەر: **گران** ٤. *[مەجاز]* چالاک؛ فرز؛ کرژ؛ تون ‹دەستی سووک› ٥. *[مەجاز]* هێور؛ هێمن؛ ئاسوودە؛ ئارام؛ ڕاحەت ‹تۆزێ گریام، سووک بووم› ٦. هاسان؛ سانا؛ ساکار ‹کارێکی کە پێک دێ سووک و هاسان/ پێی ناوێ هەرا و گوڕین و ڕاسان «هێمن»›. بەرانبەر: **دژوار** ☰ ١تا۶ سبُک

⊡ **سووک بوون:** ١. قورس نەبوون ‹بارێکی سووکە› ‹خەوم سووکە› ٢. بەهێز نەبوون ‹خەوم سووکە› ٣. بەپیت بوون ‹دەستی سووکە› ٤. *[مەجاز]* بێ‌قەدر و بێ‌بایەخ بوون ‹هەڵس‌وکەوتی زۆر سووکە› ٥. کەم بوونەوەی قورسی شتێک ‹ئەو دوانە لا ببەی سووک دەبێ› ٦. *[مەجاز]* ئارام بوونەوە؛ دابەزینی توندی و گوشار ‹لە دوێنێوە ئێشەکەی سووک بووە› ٧. زەبوون بوون ‹نامەوێ لە پێش چاوی خەڵک سووک بم› ٨. *[مەجاز]* کەم بوون ‹قەرزەکەم سووک بووە› ☰ ١تا۴. سبُک بودن ۵تا۷. سبُک شدن ۸. کم شدن

**سووک کردن:** ١. لە کێش کەم کردن ٢. *[مەجاز]* ئابروو بردن ☰ ١. سبُک کردن ٢. رسوا کردن

**دەسنوێژ سووک بوون:** *[شووره‌یی، پلار]* با لێ بەربوون، زۆرتر لە ترسان ‹ئەشەدەمبیللا تۆ لە

تەیارە ناترسی، بەلام ڕەنگە دەستنویژت سووک بووبێ! «هەژار، چێشتی مجێور»» 🇮🇷 باد خالی کردن از ترس

**سووک**[٣]: ناوەڵکار. ١. زوو؛ بلەز ٢. هێواش ‹ها سووک پێدانێ لە سەر خاکی ڕەش!/ ڕەشێنەی چاوی نیگارێ بووە «گۆران»› 🇮🇷 ١. زود ٢. یواش

**سووک ـ**[٤]: پێشوشە. سۆک ـ؛ چالاک ‹سووکدەست› 🇮🇷 سبک ـ

**ـ سووک**[٥]: پاشەوشە. ١. فرز ‹دەس‌سووک› ٢. پاک و شاد ‹ڕۆحسووک› ٣. دڵخواز و پەسند ‹ئێسکسووک› ٤. هندک؛ ناتەواو ‹عەقڵسووک› 🇮🇷 ١تا٣. سبک ـ

**سووکایەتی** / sûkayetî/: ناو. سۆکایەتی؛ بێحورمەتی ‹ئەوەی سووکایەتی بوو کردی پێمان/ نەدەکرا کەس بلێ بۆ وا دەکەی تۆ؟ «هێمن»›.
هەروەها: **سووکایەتی (پێ) کردن** 🇮🇷 اهانت

**سووکبار** / sûkbar/: ناوەڵناو. بارسووک 🇮🇷 سبُکبار

**سووکدەس** / sûkdes/: ☜ **دەستسووک**

**سووکدەست** / sûkdest/: ☜ **دەستسووک**

**سووکسووکە** / sûksûke/: ناو. دانکە؛ دانیە؛ دڕێلە؛ سۆکە؛ سۆکا؛ سووکە؛ ئاولە مەل؛ خووریکەی مریشک؛ ئازارە مریشک؛ نەخۆشینێکی گیرۆی مرۆڤە کە زۆرتر لە منالیدا سەرهەلدەدا 🇮🇷 آبلەمُرغان

**سووکفرۆش** / sûkf(i)roş/: ناوەڵناو. تەرازووباز؛ کەمفرۆش 🇮🇷 کم‌فروش

**سووکە**[١] / sûke/: ناو. ١. ☜ **سووکسووکە** ٢. میلەی کاموا چنین 🇮🇷 ١. ☜ **سووکسووکە** ٢. میلەی بافندگی

**سووکە ـ**[٢]: پێشوشە. کەم؛ هندک ‹سووکەسەر؛ سووکەخەو؛ سووکەناو› 🇮🇷 مُختصر

**سووکەبازاڕ** / sûkebazař/: ناو. بازارچە 🇮🇷 بازارچە

**سووکەپێڵاو** / sûkepêław/: ناو. شمشمک؛ سەرپایی؛ پاپووچە 🇮🇷 دمپایی

**سووکەخەو** / sûkexew/: ☜ **سووکەڵەخەو**

**سووکەسوار** / sûkes(i)war/: ☜ **سووکەڵەسوار**

**سووکەلە** / sûkele/: ☜ **سووکەڵە**

**سووکەلەسوار** / sûkeles(i)war/: ☜ **سووکەڵەسوار**

**سووکەڵە**[١] / sûkeɫe/: ناوەڵناو. سووکەلە؛ چکۆلەی سووک 🇮🇷 سبُک کوچک

**سووکەڵە ـ**[٢]: پێشوشە. بووچکەلە؛ پچووک ‹سووکەڵەکار› 🇮🇷 کوچک

**سووکەڵەتا** / sûkeɫeta/: ناو. نچەتا؛ تا و لەرزی سووک 🇮🇷 تب سبک

**سووکەڵەخەو** / sûkeɫexew/: ناو. سۆکەخەو؛ سووکەخەو؛ خەوی کەم و کورت 🇮🇷 خواب سبک و مُختصر

**سووکەڵەسوار** / sûkeɫes(i)war/: ناو. سووکەلەسوار؛ سووکەسوار؛ سوارچاک 🇮🇷 سوارکار ماهر

**سووکەڵەناو** / sûkeɫenaw/: ناو. ناوی پچووککراو 🇮🇷 اسم مُخفف

**سووکی** / sûkî/: ناو. سۆکی؛ سفکی: ١. پێچەوانەی قورسی ٢. بێئابڕوویی 🇮🇷 ١. سبک‌وزنی ٢. رسوایی

**سوول** / sûl/: ناو. ١. پلوور؛ پلووسک ٢. ئاوهەڵدێر؛ تاڤگە ٣. سورک؛ خەزێنە؛ حەوزۆکەی گەرماو ٤. سەول؛ داری سەرو 🇮🇷 ١. ناودان ٢. آبشار ٣. حوضچەی گرمابە ٤. درخت سرو

**سوولا** / sûla/: ناو. گیایەکی دەرمانی گوڵزەردی گەلاپانە 🇮🇷 گیاهی دارویی

**سوولاڤ** / sûlav/: ناو. سولاڤ؛ سویلاڤ؛ سۆلاڤ؛ سوولاو؛ سوولان؛ سوولاوک؛ سوولاوگە: ١. سوویلاڤ؛ ئاوهەڵدێر؛ تاڤگە ٢. پلووسک 🇮🇷 ١. آبشار ٢. ناودان

**سوولان** / sûlan/: ناو. ١. هەنگوان؛ گیایەکە بۆ دەرمان و لەوەڕ باشە ٢. شایی؛ هەڵپەڕکێ ٣.

☜ سولاڤ ■ ١. گیاه انگدان ٢. رقص و پایکوبی ٣. ☜ سولاڤ

**سولاو** / sûlaw/: ☜ **سولاڤ**

**سولاوک** / sûlawik/: ☜ **سولاڤ**

**سولاوکە** / sûlawke/: ناو. پلووسک؛ پلوور ■ ناودان

**سولاوگە** / sûlawge/: ☜ **سولاڤ**

**سولک** / sûlik/: ناو. ١. پلووسک؛ پلووره ٢. گەرووڵەی ئاسیاو ٣. *[مەجاز]* ساوا؛ منداڵی تازەزاو ■ ١. ناودان ٢. ناو آسیا ٣. نوزاد

**سولکە** / sûlke/: ناو. سووتکە؛ سۆنکە: ١. سوێنکە؛ سونکە؛ پاشماوەی تەنکی سابوون ٢. پاشماوەی وردی کەشک لە پاش سوونەوە ٣. *[مەجاز]* ساوا؛ منداڵی تازەزاو ■ ١. تەماندەی صابون ٢. تەماندەی کشک بعد از ساییدن ٣. نوزاد

**سولەڕمە** / sûleř(i)me/: ناو. چلووره؛ زەمبلە ■ دنگالە

**سولی** / sûlî/: ناو. جەرگ و ناو؛ دڵ و گورچیلە و جەرگ ■ دل و جگر و قلوە

**سولیکەباب** / sûlîkebab/: ناو. جەرگ و دڵی برژاو ■ کباب دل و جگر و قلوە

**سولێن** / sûlên/: ناو. ژێری ئاو؛ ژێراو ■ زیرآب

**سوڵانەوە** / sûłanewe/: چاوگ. چووزانەوە ■ دچار سوزش شدن

**سون**[1] / sûn/: چاوگ. ساوین ■ ساییدن

**سون**[2]: ☜ **سن ـ٢**

**سونای** / sûnay/: ☜ **ساوین**

**سوند** / sûnd/: ☜ **سوێند**

**سونو** / sûnû/: ناو. چۆنیەتی سوون هاتنەوە؛ بالغ بوون (بۆ سەگ و تازی) ■ بلوغ (سگ و تازی)

**سونە** / sûne/: ناو. ١. ☜ **سن ـ٢** ٢. ☜ **سۆنە**

**سونەوە** / sûnewe/: چاوگ. سوین؛ ساوین ■ ساییدن

**سووە** / sûwe/: ناو. ڕەگەز؛ بنچینە ■ نژاد

**سوی** / sûy/: ناو. سوو؛ داخ و عەزرەت ■ درد و حسرت

**سویاگ** / sûyag/: ☜ **سواو**[2]

**سویان** / sûyan/: ☜ **سوان**[1]

**سویای** / sûyay/: ☜ **سوان**[1]

**سویر**[1] / sûyr/: ناو. ١. سوور؛ سۆر؛ سوهر ٢. سوور؛ میوانی و بەزم ■ ١. سُرخ ٢. جشن و سور

**سویر**[2]: ئاوەڵناو. ١. سوور؛ سۆر؛ سوهر؛ بە ڕەنگی سوور ٢. سوور؛ بەتین؛ داخ ■ ١. سُرخ رنگ ٢. داغ

**سویلاڤ** / sûylav/: ☜ **سولاڤـ١**

**سوین** / sûyin/: چاوگ. سووین؛ بە هەسان تیژ کردن ■ با فسان تیز کردن

**سویە** / sûye/: ☜ **سپڵ**

**سویین** / sûyîn/: ☜ **سوین**

**سە** / se/: ناو. سەگ؛ سپڵۆت؛ بەشدار؛ چوارپێ؛ سپەڕ ■ سگ

**سەب** / seb/: ئاوەڵکار. تاوێ؛ وچانێ؛ جارێ ‹باران سەب وەستایە› ■ موقتاً

**سەبا**[1] / seba/: ناو. ١. سبح؛ بەرەبەیان ٢. بەیانی؛ سۆزی ■ ١. بامداد ٢. فردا

**سەبا**[2]: ئامراز. لە بەر؛ بۆ (خاتری) ‹سەبا تە هاتم› ■ برای؛ به خاطرِ

**سەبارەت** / sebaret/: ئامراز. سەور: ١. لەبەر؛ بۆ خاتری؛ سەبا ٢. لە بارەی؛ لەمەڕ ■ ١. برای؛ به خاطر ٢. دربارەی

**سەبر**[1] / sebr/: ناو. ١. حەوسەلە؛ پشوولەسەرخۆیی ٢. سەور؛ تاقە پژمە لە سەرەتای کار یان سەفەر، کە گوایە نیشانەی نەهاتە ٣. زبڵ و زاڵی ماڵ ■ ١. شکیبایی ٢. تک‌عطسەی بدشگون ٣. آشغال

⊡ **سەبر کردن**: سەور کردن: ١. ڕاوەستان ٢. هەڵگرتن ■ ١. صبر کردن ٢. تحمل کردن

**سەبر هاتن:** سەور هاتن: ۱. تاق پژمین لە دەستپێکردنی کارێکا، کە گوایە نیشانەی نەهاتییە ۲. سەبووری هاتن ☰ ۱. تک‌عطسە کردن کە بدشگون است ۲. صبوری کردن

**سەبر هێنان:** تاق پژمین ☰ تک‌عطسە کردن

**سەبر**[۲]: ئاوەڵکار. سەور؛ هێدی؛ نە توند ‹سەبر برۆ!› ☰ آهستە

**سەبرکە . سەبرکە** / seb(i)rke seb(i)rke/: ئاوەڵکار. هێدی ـ هێدی؛ زۆر لەسەرخۆ ☰ سلانە ـ سلانە

**سەبرگە** / sebrge/: ناو. زبڵدان؛ شخڵدان ☰ آشغالدان

**سەبرگەچی** / sebrgeçî/: ناو. زبڵماڵ؛ سپوور ☰ رُفتگر

**سەبرۆکە** / sebroke/: ئاوەڵناو. سەبرۆکە؛ لەسەرخۆ ☰ دشوار

**سەبز** / sebz/: ☜ سەوز

**سەبزە** / sebze/: ☜ سەوزە[۱]ـ۱

**سەبزی** / sebzî/: ☜ سەوزی

**سەبل** / sebl/: ناو. پشتێر؛ گەوڕ؛ تەویلە ☰ اصطبل

**سەبنێسی** / sebnêsî/: ناو. نەخۆشییەکی سەگە ☰ از بیماری‌های سگ

**سەبۆچی** / seboçî/: ئاوەڵکار. لە بەر چی ☰ برای چە؛ چرا

**سەبوری** / sebûrî/: ناو. ۱. پڕزوویی؛ بە برستی؛ پشوولەسەرخۆیی؛ بێن‌فرەهی؛ دۆخ یان چۆنیەتی بەتاقەت و پشوودرێژ بوون ‹پەرێشانم لە حەسرەت دەردی دووری/ بە لوتفی خۆت بدەی یا ڕەب سەبووری «بێخود»› ۲. ڕەوتی سرەوتن؛ ئارام بوونەوە و ئێش نەمان. هەروەها: **سەبوور** ☰ ۱. صبوری ۲. تسکین

⊡ **سەبوری دان:** ئارام کردنەوە بە هۆی نەهێشتنی ئێش و ئازار ‹نەخۆشی چاوەکانت بووم و خەندەی تۆ سەبووری دام/ شیفای بیماری خۆت دا، گولشەکەر باری لە زاری تۆ «وەفایی»› ☰ تسکین دادن

**سەبون** / sebûn/: ناو. سەمبوور: ۱. گڕەبا؛ گڕە؛ بای زۆر گەرمی گیاندارکوژ ‹جۆش مەدا سەبوون شارەزوور دڵ/ سیروان هوونـاو دەروونش کوڵ‌کوڵ «مەولەوی»› ۲. قەدەم؛ تینێ کە لە قرچەی هاویندا وەک شەپۆل لە نزیک زەوی دەبینرێت ☰ ۱. باد سام ۲. هُرم گرما

**سەبەب** / sebeb/: ناو. هۆ؛ سۆنگە ☰ سبب

**سەبەت** / sebet/: ☜ سەوەتە

**سەبەتانە** / sebetane/: ناو. سێرەی تفەنگ ☰ مگسک تُفنگ

**سەبەتچن** / sebetçin/: ناو. سەبەتەچن؛ کەسێ کە سەوەتە دروست دەکا ☰ سبدباف

**سەبەتۆلکە** / sebetûlke/: ناو. سەبەتی پچووک ☰ سبد کوچک

**سەبەتە** / sebete/: ☜ سەوەتە

**سەبەتەبەسەرێ** / sebetebeserê/: ناو. سەوەتەسەرێ؛ کایەیەکی منداڵانە ☰ از بازی‌های کودکان

**سەبەتەچن** / sebeteçin/: ☜ سەبەتچن

**سەبەل** / sebel/: ناو. سەبەڵ؛ نەخۆشییەکی چاوە ☰ سبل؛ بیماری چشم

**سەبەڵ** / sebeł/: ☜ سەبەل

**سەبیل** / sebîl/: ناو. ۱. سەبیل؛ ئامرازی تووتن کێشان ۲. ئاوی خێرێ ☰ ۱. چُپُق ۲. آب سبیل

**سەبیل‌تێکەر** / sebîltêker/: ئاوەڵناو. [کینایە] درۆزن؛ فشەکەر ☰ دروغگو

**سەبیلچی** / sebîlçî/: ☜ سەبیل‌ساز

**سەبیلخۆر** / sebîlxor/: ناو. سەبیل‌کێش؛ کەسێ کە تووتن بە سەبیل دەکێشێ ☰ چپق‌کش

**سەبیل‌ساز** / sebîlsaz/: ناو. سەبیل‌چی؛ کەسێ سەبیلی تووتن دروست دەکا ☰ چُپُق‌ساز

**سەبیل‌کێش** / sebîlkêş/: ☜ **سەبیل‌خۆر**

**سەبیلە** / sebîle/: ناو. ۱. سەبیل؛ سەویلە؛ ئامرازی قوڕینی تووتن کێشان ۲. تەڵەئاسنێ کە دە سەر بۆڕی ئاوی دەگرن ▪ ۱. چُپُق ۲. گیره‌ی سر لوله‌ی آب

**سەپ** / sep/: ناو. کۆما؛ هەندێ لە شتێکی سفت ▪ توده

**سەپان**[۱] / sepan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //سەپای؛ دەسەپێی؛ بسەپە// داسەپان؛ گوشارێک کەوتنە مل؛ نەبەدڵ تووش بوون ▪ تحمیل شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: سەپاو/ چاوگی نەرێنی: نەسەپان

**سەپان**[۲]: ناو. ڕەنجبەری دەستەبەر کە لە پێنج بەش بەشێک لە بەهرە دەگرێ ▪ کارگر کشاورزی که یک پنجم بهره می‌گیرد

⊡ **شا بە سەپانی خۆ نەزانین**: [کنایە] ئاغاش بە نۆکەری نەگرتن؛ خۆ زۆر بە زل زانین؛ دەمار نەهێنان ‹جاران کەس جوابی سەلامەکەی نەدەداوە، ئێستا وای لێ هاتووە شا بە سەپانی خۆی نازانێ› ▪ خدای خود را بنده نبودن

**سەپان‌ترێنە** / sepant(i)řêne/: ☜ **سەرناسینە**

**سەپاندن** / sepandin/: چاوگ. تێپەڕ. //سەپاندت؛ دەسەپێنی؛ بسەپێنە// داسەپاندن؛ بە زۆر تووش کردن؛ بە ملدا هێنان ▪ تحمیل کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەسەپاندن

**سەپانی** / sepanî/: ناو. ۱. کاری سەپان ۲. بەهرەیێ کە بە سەپان دەگا ▪ ۱. کار زراعت در مقابل یک پنجم محصول ۲. مُزد یک پنجم بهره‌ی کارگر کشاورزی

**سەپتک** / septik/: ناو. ۱. بەردی بەردەڕێژی سەر ڕێ ۲. جۆگە ئاوی داپۆشراو ▪ ۱. سنگ سنگفرش ۲. آبرو سرپوشیده

**سەپک** / sep(i)k/: ناو. ۱. ئامرازی پۆی چادر کوتان ۲. سەولە؛ خەپلە؛ کولێرەی ئەستوور لە درشتەی ئارد، بۆ سەگ ▪ ۱. ابزار پودکوبی چادربافان ۲. نواله از نُخاله برای سگ

**سەپکە** / sepke/: ناو. ۱. سەپک؛ کولێرەی لە درشتەئارد ۲. قاشاو؛ محەس؛ ڕنەک ▪ ۱. نواله از نُخاله ۲. قشو

**سەپنای** / sepnay/: چاوگ. سەپاندن ▪ تحمیل کردن

**سەپۆل** / sepol/: ئاوەڵناو. سەپۆلە؛ سەپەڵ؛ حەپۆل؛ گێلۆکە ▪ پخمه

**سەپۆلە** / sepole/: ☜ **سەپۆل**

**سەپەکە** / sepeke/: ☜ **سەگ**[۱]

**سەپەڵ**[۱] / sepel/: ☜ **سپڵ**

**سەپەڵ**[۲]: ☜ **سەپۆل**

**سەپەلیک** / sepalîk/: ناو. ۱. جەرگی سپی؛ جێگەی هەناسە دان لە دەروونـدا ۲. قلیان؛ قلیاناوی ▪ ۱. ریه؛ شُش ۲. قلیان

**سەپی** / sepî/: ئاوەڵناو. پالاوتە؛ پاڵفتە؛ پاڵێوراو ▪ پالوده

**سەپیای** / sepyay/: چاوگ. سەپان ▪ تحمیل شدن

**سەپیە** / sepye/: ☜ **سپێ**

**سەپێنران** / sepênran/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //سەپێنرای؛ دەسەپێنرێی؛ بسەپێنرێ// وە بەر سەپاندن کەوتن ▪ تحمیل شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: سەپێنراو/ چاوگی نەرێنی: نەسەپێنران

**سەپێنراو** / sepênraw/: سەلمێنراو بۆ جێبەجێ کردن ▪ تحمیل شده

**سەت** / set/: ناو. سەد؛ ژمارەی دوای نەوەت‌ونۆ ▪ صد

**سەتاسەد** / setased/: ☜ **سەدلەسەد**

**سەترل‌حەمام** / setrilĥemam/: ناو. پارچەیەکە لە

بەر تاو بە چەند ڕەنگ دەنوێنێ 🇮🇷 پارچەایست کە در آفتاب بە چند رنگ دیدە می‌شود

**سەترنج** / setrinc/: ☜ **شەترەنج**

**سەترە** / setre/: ناو. زللە؛ زلە 🇮🇷 سیلی

**سەتک** / set(i)k/: ناو. سەیدووکە؛ گیایەکە بەری لە نۆک دەچێ و بە شینی دەخورێ 🇮🇷 گیاهی است

**سەتکا** / setka/: ئامراز. هەرچەند؛ ئەگەرچی 🇮🇷 هرچند

**سەتڵ** / set(i)ɫ/: ناو. سەتلە؛ سەتڵ؛ دۆڵ؛ باڵدی؛ پەقرەج؛ ئەلپ؛ دەفرێکی قووڵ و دەسکدار بۆ هەلگرتن و گواستنەوەی تراو 🇮🇷 سطل

**سەتڵوجەم** / setɫ û cem/: ناو. بەرەزام؛ زاتولجەنب؛ ساتوورجەم؛ نەخۆشییەکە بە پەتاوە دەس پێدەکا و یاو، کۆخە، چلک و هەناسەگرژی لەگەڵە 🇮🇷 ذات‌الجنب

**سەتڵە** / setɫe/: ☜ **سەتڵ**

**سەتم** / setm/: ناو. چۆنیەتی داڕووخان؛ داڕمان 🇮🇷 حالت فروریختن

**سەتمان** / setman/: چاوگ. ١. پڕبوونەوەی چاڵ ٢. ڕووخانی دیوار 🇮🇷 ١. پُر شدن چاله ٢. فروریختن دیوار

**سەتماندن** / setmandin/: چاوگ. ١. پڕ کردنەوەی چاڵ ٢. ڕووخاندنی دیوار 🇮🇷 ١. پُر کردن چاله ٢. رُمباندن دیوار

**سەتمە** / setme/: ☜ **ساتمە**

**سەتمین** / setmîn/: چاوگ. وێران بوون 🇮🇷 ویران شدن

**سەتە** / sete/: ناو. چەرخ؛ سەدساڵ 🇮🇷 سده؛ قرن

**سەتەلایت** / setelayt/: ناو. ماهوارە 🇮🇷 ماهواره

**سەتەمین** / setemîn/: ☜ **سەدەمین**

**سەجع** / sec'/: ناو. *[ئەدەبیات]* جۆرێ وێکهاتنەوەی کۆتایی ڕستە یان نیوڕستەکان (وەک: «گۆڕ» و «سەرشۆڕ» لە ڕستەی «پیاو لاشەی لە ناو گۆڕ بێ، نەک بمێنێ و سەرشۆڕ بێ») 🇮🇷 سجع

**سەجەرە** / secere/: ناو. ڕەگەزنامە؛ نووسراوی ناوی باب و باپیران 🇮🇷 شجره‌نامه

**سەچاک** / seçak/: ناو. سزا؛ پاداشی چاکە و جزیای خراپە 🇮🇷 سزا

**سەچت** / seç(i)t/: ناو. کاری بۆگەڕان؛ پشکنین 🇮🇷 تفتیش

**سەچتین** / seçtîn/: چاوگ. پشکنین 🇮🇷 تفتیش کردن

**سەچە** / seçe/: ناو. ڕەیل 🇮🇷 ریل

**سەح** / seĥ/: ناو. ١. ئاگایی؛ هەست ٢. چۆنیەتی بە وردی لێ ڕوانین 🇮🇷 ١. احساس ٢. مُعاینه

⊡ **سەح کرن:** ١. شنەفتن؛ بیستن ‹من ئەو خەبەر سەح نەکریە› ٢. نۆڕین؛ تێڕوانین بە وردی ‹دوختور سەح کرێ زارۆکێ من چ بەلایە› 🇮🇷 ١. شنیدن ٢. مُعاینه کردن

**سەحات** / seĥat/: ☜ **سەعات**

**سەحانە** / seĥane/: ناو. سەعانە؛ دەفر و کاسەی مسین 🇮🇷 ظرف مسی

**سەحرا** / seĥra/: ☜ **سارا**[1]

**سەحەت** / seĥet/: ناو. ١. سلامەت؛ ساقی؛ ساغی؛ ساخی ‹سەحەتم باشە› ٢. شکڵ و بیچم؛ مەعد؛ ڕەنگوڕوو ‹پیاوێکی سەحەت خۆشە› ٣. ڕاستی؛ دروستی ‹ئەو خەبەرە سەحەتی هەیە؟› 🇮🇷 ١. سلامت ٢. رنگ‌ورو ٣. حقیقت

**سەحەتخۆش** / seĥetxoş/: ناوەلناو. سەحەتسووک؛ ڕەزاشیرین 🇮🇷 دوست‌داشتنی

**سەحەتسووک** / seĥetsûk/: ☜ **سەحەتخۆش**

**سەحەتگران** / seĥetg(i)ran/: ناوەلناو. ڕەزاگران؛ خوێنتاڵ؛ ئێسکقورس 🇮🇷 گرانجان

**سەحەر** / seĥer/: ناو. بەرەبەیان؛ سەرەتای ڕۆژ 🇮🇷 سحر

**سەحەرخێز / seĥerxêz/**: ئاوەڵناو. زووڕاب؛ زووخێز؛ هۆگر و خووگرتوو بە زوو لە خەو هەستانی بەیانانەوە 🇮🇷 سحرخیز

**سەحەری١ / seĥerî/**: ناو. جۆرە ئاهەنگێکە زۆرتر بەیانیان و بە زوڕنا، شمشاڵ یان نەی لێ دەدرێ ‹مەعدوومی غەفلەت تا چەن و پەی چی/ گۆش دەر ماچۆ تەرز سەحەری نەیچی «مەولەوی»› 🇮🇷 آهنگی است کە بیشتر با سُرنا نواختە می‌شود

**سەحەری٢**: ئاوەڵکار. لە کاتی سەحەردا ‹سبەی سەحەری دەڕۆم› 🇮🇷 هنگام سحر

**سەحەن / seĥen/**: ناو. دەفری مسی هەراو 🇮🇷 قاب مسی

**سەحەنچە / seĥençe/**: ☜ سەعەند

**سەحەند / seĥend/**: ☜ سەعەند

**سەخ / sex/**: ناو. سەغ: ١. میچ؛ سرمیچ؛ بنمیچ ٢. مەلاشوو؛ مەلاشک؛ ئاسمانەی دەم 🇮🇷 ١. سقف خانە ٢. سَق؛ کام

**سەخاوەت / sexawet/**: ناو. دەهندەیی؛ دلاوایی 🇮🇷 بخشندگی

**سەخبیر / sexbîr/**: ناو. سەغبیر: ١. چاوێر؛ ئاگادار ٢. سەرپەرست؛ سەرپەرشت. هەروەها: **سەخبیری** 🇮🇷 ١. مُراقب ٢. سرپرست

**سەخت١ / sext/**: ناو. ١. سەرمای بەتەوژم ٢. کێوی دژوار و هەڵەمووت 🇮🇷 ١. سرمای شدید ٢. کوه صخره‌ای دشوارگُذر

**سەخت٢**: ئاوەڵناو. ١. ڕەق؛ توند ‹دلیشی ئەوەندە سەخت و ڕەق نەبوایە، تا ئێستا ڕەشەبا هەزار جار تلاوتل بردبووی «شێرکۆ»› ٢. تووش؛ دژوار ‹زستانی سەخت› ٣. پێداگر و لاسار ‹کابرایەکی یەکجار سەختە و تازە لە قسەی خۆی پاشگەز نابێتەوە› 🇮🇷 ١. سخت؛ سفت ٢. دشوار ٣. لجباز

**سەخت ـ٣**: پێشوشە. سەختە؛ ڕەق؛ زەب؛ خاوەن ڕەقی یان پتەوی ‹سەختامێر؛ سەختپێست› 🇮🇷 سخت ـ

**ـ سەخت٤**: پاشەوشە. ـ ڕەق؛ ـ گران؛ ـ پتەو ‹سەرسەخت› 🇮🇷 ـ سخت

**سەختامێر / sextamêr/**: ناو. ڕەقامێر؛ ڕەقەواڵە: ١. لەتە و پاژی ئیلیکترۆنیکی و میکانیکی کەمپیوتەر ٢. لەتە و دەزگای کانزایی ماشین ٣. جەنگامێری کانزایی ٤. ئامێری فێرکاری (وەک: ویدیۆ؛ زەبت، گرام و...) * بەرانبەر: **نەرمامێر** 🇮🇷 ١تا٤. سخت‌افزار

**سەختان / sextan/**: ناو. سەخناخ؛ ڕەقەن؛ بەردەڵان 🇮🇷 زمین سخت و سنگلاخ

**سەختباوەڕ / sextbaweř/**: ئاوەڵناو. باوەڕگران؛ دێرباوەڕ 🇮🇷 دیرباور

**سەختگر / sextgir/**: ئاوەڵناو. سەختگیر؛ توند و تیژ؛ بەزاکوون؛ خاوەن خوو یان ئۆگرەتی بە پێداگری لە سەر قسە و ویست ‹بەڕێوەبەری سەختگر›. هەروەها: **سەختگر بوون** 🇮🇷 سختگیر

**سەختگری / sextg(i)rî/**: ناو. سەختگیری: ١. کار و ڕەوتی هەڵپێچانی خەڵک بە: *ئا)* کاری دژوار *ب)* هەڵکردن لە بارودۆخی دژواردا *ج)* چاو برینی ورد و توند لە سیستەم، دەستوور یان قانوون ‹بابم لە ئاست مندا زۆر سەختگری دەکرد› ٢. بەزاکوونی؛ پێداگری؛ داکۆکی زۆر، بەتایبەت لە شۆنگری و پێداگرتن لە سەر قانوون، دەستوور یان بەرنامە ‹ئەمساڵ لە قوتابخانەدا زۆر سەختگری دەکەن›. هەروەها: **سەختگری کردن** 🇮🇷 ١و٢. سختگیری

**سەختگیر / sextgîr/**: ☜ سەختگر

**سەختگیری / sextgîrî/**: ☜ سەختگری

**ـ سەختە / sexte-/**: ☜ سەخت٣

**سەختی / sextî/**: ناو. ١. پتەوی؛ ڕەقی ٢. ئاستەمی؛ دژواری ٣. سەرڕەقی؛ لاساری ٤. کاری ڕاسپاردن 🇮🇷 ١. سفتی ٢. سختی ٣. سرسختی

٤. سفارش
◘ **سەختی کردن**: ١. سەرڕەقی نواندن؛ لاساری کردن ٢. ڕاسپاردن ‹ف› ١. سرسختی نشان دادن ٢. سفارش کردن
**سەختیان** / sext(i)yan/: ناو. ١. پێستی لە دەباغدراو ٢. سفرەی چەرمی نانکەر ٣. زوێڵەچەرم ‹ف› ١. پوست دباغی‌شده ٢. سفرەی چرمی نانوایان ٣. بُرشی از چرم
**سەخردان** / sexirdan/: ناو. سفرە؛ خوان ‹ف› سُفره
**سەخڵەت**[1] / sexłet/: ناو. سخڵەت؛ سەغڵەت؛ دژواری؛ ئاستەمی؛ ئاستەنگی؛ تەنگاوی ‹بەم چەشنەیە کە تۆ بە درێژایی مێژوو ژیاوی و لە بەر تۆفان و باو بۆران و بەفر و سەخڵەت و سەرما وەستاوی «سوارە»› ‹ف› سختی
**سەخڵەت**[2]: ئاوەڵناو. سخڵەت؛ سەغڵەت: ١. داماو؛ سەرگەردان؛ دوودڵ ٢. لێژی تیژ و ئەستەم لە کەژدا ‹ف› ١. درمانده ٢. دارای شیب تُند
**سەخڵەتی** / sexłetî/: ناو. چەرمەسەری؛ گێرەوکێشە ‹ف› رنج و مشقت
**سەخمە** / sexme/: ناو. ١. کەلاوە؛ لاوار؛ دار و پەردووی خانووە ڕووخاو ٢. سوخمە؛ داڵیت؛ داڵووت؛ دارێ کە بەر داری مێوی دەدەن ٣. دارێکی بە گرێیە لە سێبەرێدا مەشکە و دۆدانەی پێدا هەڵدەواسن ‹ف› ١. آوار ٢. چوبی که درخت مو را بر آن تکیه می‌دهند ٣. چوبی که مشک را بر آن می‌آویزند
**سەخمەراتی**[1] / sexmeratî/: ناو. سەبەب؛ هۆ ‹ف› سبب
**سەخمەراتی**[2]: ئامراز. ئەگەر؛ ئەیەر؛ هاتوو؛ بێتوو؛ پیتی مەرج ‹ف› اگر
**سەخناخ** / sexnax/: ناو. ساخناخ؛ سەختان؛ ڕێگای سەخڵەت لە کێودا ‹ف› زمین سخت و سنگلاخ
**سەخور** / sexur/: ناو. عەرک؛ ورگ؛ ئەشقەمە ‹ف› اشکمبه
**سەخوڕ** / sexuř/: ناو. پەلخوڕ؛ کای خوراوی ناوزگی حەیوان ‹ف› علف نشخوار نشده
**سەخوڕدان** / sexuřdan/: ناو. جێگەی سەخوڕ؛ ورگی حەیوان ‹ف› معده‌ی نشخوارکنندگان
**سەخوڕگە** / sexuřge/: ناو. جێگەی سەنێر لێ ڕشتن؛ گووفک؛ سەرانگوێلک ‹ف› شوله؛ سرگینگاه
**سەخوڕمە** / sexuřme/: ☜ سخورمە
**سەخۆرە** / sexore/: ناو. تووی سپی نزیک بە گەیشتن ‹ف› توت نزدیک به رسیدن
**سەخەر** / sexer/: ناو. ئابڕوو؛ ناوی باش ‹ف› خوشنامی
◘ **سەخەر برن**: ئابڕوو بردن ‹ف› رسوا کردن
**سەخەری** / sexerî/: ناو. سەختیان؛ چەرمی ئەستووری لە دەباغدراو ‹ف› چرم ساغری
**سەخەل** / sexel/: ناو. پز؛ ئاوەلەمە ‹ف› جنین
**سەخی** / sexî/: ئاوەڵناو. سەغی؛ دلاوا؛ بەخشندە ‹ف› بخشنده
**سەخیر** / sexîr/: ئاوەڵناو. سەغیر: ١. سێوی ٢. هەتیو؛ هەتیم ‹ف› ١. صغیر ٢. یتیم
**سەخیربار** / sexîrbar/: ناو. سەغیربار؛ هەتیمبار؛ بێوەژنێ کە منالی وردی هەبێ ‹ف› یتیم‌بار
**سەد** / sed/: ناو. ١. بەربەندی ئاو ٢. سەت؛ نەوەد و نۆ و یەک ‹ف› ١. سد ٢. صد
**سەدا** / seda/: ناو. ١. دەنگە؛ دەنگ؛ ئەوەی دەبیسرێ ٢. چۆنیەتی دەنگ ‹هامدەردان ئامان ئەر مەنەن هۆشم/ سەدای وەشێوەن مەیۆ نە گۆشم «مەولەوی»› ‹ف› ١و٢. صدا
**سەدارە** / sedare/: ناو. سدارە؛ جۆرێ کلاو ‹ف› نوعی کلاه
**سەددڵ** / seddił/: ئاوەڵناو. دوودڵ؛ دڕدۆنگ ‹ف› دودل
**سەدری** / sedrî/: ناو. جۆرێ برنجی باش ‹ف› برنج

صدری

**سەدرییە / sedrîye/**: ناو. جلیسقە؛ جلیقە؛ سوخمەی بێقۆڵی پیاوانە 🇮🇷 جلیقه

**سەدلەسەد / sed le sed/**: ئاوەڵکار. سەدوسەد؛ سەدیسەد؛ سەتا سەد؛ تەواو بێ کەمایەسی 🇮🇷 صددرصد

**سەدوسەد / sed û sed/**: ☜ سەدلەسەد

**سەدوم / sedum/**: ☜ سەدەم[1]

**سەدومین / sedumîn/**: ☜ سەدەمین

**سەدە / sede/**: ناو. سەتە؛ سەد ساڵ؛ چەرخ 🇮🇷 سده؛ قرن

**سەدەف / sedef/**: ناو. لەپکە؛ قاوغ؛ قالک؛ گوێماسیلە؛ گەوهەران؛ پۆشەنی قسلی کە بڕێ ئاوژی بۆ خۆ پاراستن دەریدەدەن و بە ماسوولکەیەک لە ناوەوە پێوەی دەلکێن 🇮🇷 صدف

**سەدەقە / sedeqe/**: ناو. ساقە؛ خێر؛ دەستاندە؛ ماڵێ کە لە ڕێگەی خودا بە هەژاران دەدرێ 🇮🇷 صدقه؛ خیرات

**سەدەم[1] / sedem/**: ئاوەڵناو. سەدوم؛ بە ڕیز، پلە، یان ڕزنی سەدەوە 🇮🇷 صدُم

**سەدەم[2]**: ئامراز. بۆ؛ لەبۆ؛ سەبا؛ بۆ خاتری 🇮🇷 برای؛ به خاطرِ

**سەدەمە / sedeme/**: ناو. بەلا؛ ئازار؛ زیان 🇮🇷 آسیب

**سەدەمین / sedemîn/**: ئاوەڵناو. سەتەمین؛ سەدومین؛ بە ڕیز، پلە و ڕزنی سەدەمەوە 🇮🇷 صدُمین

**سەدیسەد / sedîsed/**: ☜ سەدلەسەد

**سەدیەک / sedyek/**: ناو. سانتیم؛ یەک لە سەد 🇮🇷 یکصدُم

**سەر[1] / ser/**: ناو. ١. لە ئەستۆ بەرەژووری گیانـدار ‹سەر لەبۆ سەربازی چاکە زک لەبۆ چەتفەی گران/ دڵ لەبۆ خەمخۆری چاکە نەک لەبۆ میهری کچان «قانع»› ٢. [ڕیزمان] یەکێ لە بزاوەکانی ئەلفوبێ ‹سەر و بۆر و ژێر› ٣. باقی ماماڵە کە وەکوو پارە یان شتێک، دەدرێ بە لایەنێک ‹گۆڕیمانەوە، شتێکیشم سەر وەرگرت› ٤. دەسپێکی ڕەوتێ ‹گزت کرد، لە سەرەوە بیکەین› ٥. داپۆشی دەفر ‹سەری مەنجەڵ› ٦. یەکەی بژاردنی مرۆڤ و بڕێ ئاژەڵ ‹دە سەر خێزانین؛ چوار سەر بزنم هەیە› ٧. ئاکام؛ ئاخر ‹وەرە با بیکەین دلداری خۆمان/ ئەم دنیا تا سەر نامێنێ بۆمان «فولکلۆر»› ٨. لای بەرەو بان ‹سەر و خوار› ٩. [مەجاز] قژی سەر ‹سەر تاشین؛ سەر داهێنان› ١٠. ژیان؛ گیان ‹سەری نایە بان ئەو کارەوە› ١١. پاژی دوایین یان بەرزتری ئەندام ‹سەری قامک؛ سەری شان› ١٢. بیر و هزر ‹سەری سوور دەمێنێ؛ سەرم لێ دەرناچێ› ١٣. سەرەتا؛ دەسپێک ‹سەری ساڵ› ١٤. وەرز؛ سەردەم ‹سەری پیری› ١٥. پۆپە؛ بان؛ بەشی ژووروی هەر شتێ لە حاڵەتی ئەستوونیدا ‹سەری دار؛ سەری بان› ١٦. میچ؛ سرمیچ؛ ئاسمانە ‹سەریان بە دار گرتووە› ١٧. نۆبە؛ سەرە ١٨. جار؛ دەفعە ‹سەرێکیش تۆ سوار بە!› ١٩. ئالی؛ لا ‹لەم سەر تا ئەو سەر› ٢٠. چۆپی؛ دەسرۆکەی دەستی سەرچۆپیگر ‹سەر کێشان› ٢١. خاوەن دەسەڵات ‹سەرانی ولاتانی ئیسلامی› ٢٢. ئەنجام؛ کار و ڕەوتی پێکهاتن ‹ئەم کارە سەر ناگرێ› 🇮🇷 ١. سر ٢. فتحه؛ زَبَر ٣تا٦. سر ٧. آخر ٨. بالا ٩. موی سر ١٠. جان ١١. بخش انتهایی یا بالاتر اندام ١٢. فکر ١٣و١٤. سر ١٥. بالا ١٦. سقف ١٧. نوبت ١٨. بار ١٩. سو؛ جهت ٢٠. دستمال دست سردستەی رقص ٢١. صاحب قدرت ٢٢. سر؛ انجام

▣ **سەر تەتەی بن مافەتە**: [پلار] ڕواڵەت جوانی دەروون پیس 🇮🇷 دارای ظاهر زیبا و باطن خبیث

**سەری پیری**: سەرەتی/ سەردەمی پیری؛ ڕۆژگاری پیری 🇮🇷 پیرانه سر

**سەری ساڵ**: سەرەتای ساڵ؛ نەورۆز 🇮🇷 ابتدای

سال

**سەری سەکەت:** */کنایە/* شەرمەزار؛ خەجاڵەتبار ‹گەر دەتانەوێ ئەو سیسارکانە وەک کەو کەوی کەن/... سەری سەکەتیان وا پێ نەوی کەن/ ... «پەشێو»› ⧈ شرمسار

⊡ **سەر ئەستوور بوون:** */کنایە/* خەم و خەفەت زۆر بوون ⧈ پُرغصه بودن

**سەر ئێشان:** ژان کردنی سەر ⧈ سر درد کردن

**سەر ئێشاندن:** */کنایە/* جاڕز کردن ⧈ خسته کردن

**سەر بادان:** */کنایە/* سەر وادان: ١. نارازی بوون ٢. نافەرمانی کردن ⧈ ١. ناخشنود بودن ٢. سرپیچی کردن

**سەر(ی) باس داهێنان/ داهاوردن:** سەر باس دامەزراندن ⧈ سر سخن باز کردن

**سەر بردن:** بردنە سەر؛ ڕابواردن ⧈ گذراندن

**سەر بڕان:** ☜ **سەر بڕین**

**سەر بڕین:** سەر بڕان؛ سەر ژێکرن؛ سەر لە لەش جوێ کردنەوە بە تیخ ‹بەرخی نێر بۆ سەر بڕینە «مەسەل»› ⧈ سر بُریدن

**سەر بڵند کردنەوە:** ☜ **سەر بەرز کردنەوە**

**سەر بوونەوە:** سەر دەرچوون؛ زانین ‹من لە کەمپیوتەر سەرم نابێتەوە› ⧈ سر درآوردن

**سەر بە با دان:** */مەجاز/* خۆ تێدا بردن ⧈ سر خود را به باد دادن

**سەر بە خوزدا گرتن:** */کنایە/* سر داخستن و بیر کردنەوە ⧈ اندیشه کردن

**سەر بەرز کردنەوە:** سەر بڵند کردنەوە: ١. سەر هەڵبڕین/ هەڵێنان ‹سەری بەرز کردەوە و بۆی ڕوانی› ٢. */کنایە/* شانازی کردن ‹سەری بەرز کەوە! تۆ دایکی شەهیدی› ٣. */مەجاز/* ڕاپەڕین؛ شۆڕش کردن ‹ئەگەر کەسێ سەری بەرز بکردایەتەوە، دەکوژرا› ⧈ ١تا٣. سر بُلند کردن

**سەر بە گۆما کردن:** */کنایە/* سەر کردن بە گۆما؛ لە بەین بردن ⧈ سر زیر آب کردن

**سەر بێ دەلاک تاشین:** */کنایە/* دەست بۆ کاری گەورەتر لە ڕادەی خۆ بردن و بوونە هۆی دەردیسەر ⧈ سر بی آب تراشیدن

**سەر پەرژان:** دەرفەت دەس کەوتن؛ دەست گەیشتن ⧈ فُرصت کردن

**سەر پەڕاندن:** بە شمشێر یا گیوتین و ... سەر بڕین و لێکردنەوە ⧈ گردن زدن

**سەر پێ سپاردن:** */کنایە/* باوەڕی تەواو بە کەسێ بوون ⧈ اعتماد کامل به کسی داشتن

**سەر پێ کەتن:** ١. دارەدارە کردنی زارۆک ٢. چاک بوونەوە لە نەخۆشی ٣. */کنایە/* پاش نابووتی ساز بوونەوە ⧈ ١. سرپا افتادن کودک ٢. بهبود یافتن ٣. پس از افلاس دوباره سامان یافتن

**سەر پێکەوەنان:** */کنایە/* ژیان پێکەوە بردنە سەر ⧈ زندگی مشترک داشتن

**سەر پێوەنان:** ١. */پلار/* سەر تێکردن؛ بە کۆمەڵ و بێ هاوڕێژەیی بۆ شوێنێ چوون ٢. */کنایە/* بە گوڕ خەریک بوون و گەشە کردن ‹گیا سەری پێوە ناوە› ⧈ ١. گروهی و بی تناسب به جایی رفتن ٢. همه با هم بالیدن

**سەر تاشین:** ١. مووی سەر کورت کردنەوە ٢. */کنایە/* سووکایەتی بە سەر ژن هێنان ⧈ ١. اصلاح کردن سر ٢. رسوا کردن زن

**سەر تیاچوون:** */کنایە/* بە یەکجاری فەوتان ⧈ نابود شدن

**سەر تێکردن:** */پلار/* ١. سەر پێوەنان؛ بەکۆمەڵ و بێ هاوڕێژی بۆ شوێنێ ڕۆیشتن ٢. تەخشان و پەخشان کردن؛ خەرج کردنی زێدە لە پێویست ٣. خێ پێ دان؛ زۆر ئۆگری شتێک بوون و کاتی لەسەر دانان ‹لەو کاتەوە ئەم موبایلەی کڕیوە سەری تێکردووە و خەو و خواردنیشی نییە!› ⧈ ١. گروهی و بی تناسب به

جایی رفتن ۲. ولخرجی کـردن ۳. زیـاد بـه کـاری پرداختن

**سەر چوون:** ١. خـەلاس بـوون؛ نـەمان؛ دوایـی هاتن ٢. بە هەڵەدا چوون ٣. چوون؛ هەڵچوون ٤. فەوتان؛ لەناو چـوون ‹سـەری بچـێ، نـوێژی ناچێ› ☰ ۱. سرآمدن ۲. اشتباه کردن ۳. سر رفتن (شیر و امثال آن در اثر حرارت) ۴. فنا شدن

**سەر چەماندن:** ١. /کینایە/ تەسـلیم بـوون ٢. داخستنی سەر بۆ حورمەت گـرتنی گـەورە ☰ ۱. تسلیم شدن ۲. سر به احترام فرود آوردن

**سەر خستنە سەر:** /کینایە/ سەر کردنە سـەر؛ سـەر نانە سەر: ١. تیز پێکردن؛ سۆعبەت پێکـردن ٢. پێوە خەریک بوون ‹ئەو ڕادیۆ شکاوە، هەرچی سەرم خستە سەری بۆم دروست نـەبوو› ☰ ۱و۲. سربەسر گذاشتن

**سەر خواردن:** /مەجاز/ ١. بوونـە هـۆی مـەرگی کەسـێک ٢. بـە قسـەی زۆر کەسـێک وەڕەز کردن ☰ ۱و۲. سر خوردن

**سەر خوران:** /کینایە/ کەڵکەڵەی شتێ یا کارێ لە سەردا بوون ☰ سر جُنبیدن

**سەر خولانەوە:** گێژ بوون ☰ گیج شدن

**سەر(ی) خۆ هەڵگرتن:** /کینایە/ ڕۆیشـتن و ئـاوارەی وڵاتان بوون ‹بـاوەژنی ئەوەنـدەی ئـازار دا، سـەری خۆی هەڵـگرت و چـوو!› ☰ سـر بـه کـوه و بیابـان گذاشتن

**سەر خەجاڵەتی داخستن:** ☜ **سەر داخستن ـ٢**

**سەر دائاژۆتن:** /کینایە/ بە سەردا دان؛ هێـرش بـۆ بردن ☰ یورش بردن

**سەر داخستن:** ١. سـەر بـەرەو خـوار ڕاگـرتن ٢. /کینایـە/ سـەر خەجاڵـەتی داخسـتن؛ زۆر خەجاڵـەت بـوون ☰ ۱. سـر پـایین انـداختن ۲. شرمنده شدن

**سەر داکێشان:** /مەجاز/ لـێ درکانـدن؛ قسـە لـێ کێشانەوە؛ قسە لێ دەرهێنان؛ خاپاندن و قسـە لە ژێر زوان دەرهێنان ☰ حرف (از کسی) کشیدن

**سەر داگرتن:** /مەجاز/ ١. زۆر بۆ هێنان ٢. لەپـڕ و نـەکاو گـوتن ☰ ۱. تحـت فشـار قـرار دادن ۲. بی‌مقدمه گفتن

**سەر دان:** ١. دیەنی کردن؛ دیـدەنی کـردن ٢. /کینایە/ خۆ دە پێناو نان ‹ماچی دەمەکەی دامـێ کـە دامـێ سـەر و ماڵـم/ بنـواڕە چ سـەیبادە، چ جەللادە بە حاڵم! «نالی»› ٣. کاری وەک گۆلک مژاندن و لە گوان پچڕین بۆ شیر دادانی چـێڵ ☰ ۱. سـر زدن؛ دیـدن کـردن ۲. سـر بـاختن ۳. گذاشتن و بـازگرفتن گوسـاله از پسـتان بـه قصـد شیرده کردن گاو

**سەر دانان:** /کینایە/ خـۆ بـەخت کـردن؛ خـۆ بـە کوشت دان ‹لە خەرمانی ئەمەل مێرووی عەمـەل جەزبی نەکرد دانێ/ لە زیققەتخانەدا ترسم هەیـە ئاخر سەری دانێ «حەریق»› ☰ سر باختن

**سەر دانەواندن:** /کینایە/ سـەر چەمانـدن؛ چـۆک دادان؛ خۆ ڕادەست کردن ‹ئـەمن دەمگـوت لـە دنیا تا بمێنم/ لە بەر کەس ئەستەمە سەر دانەوێنم «هێمن»› ☰ سر خم کردن

**سەر دانەوە:** ١. بـاقی دانـەوە لـە مامەڵـەدا ٢. دیسان سەر لێدان ☰ ۱. باقی دادن ۲. دوباره سر زدن

**سەر داهاوردن:** ☜ **سەر داهێنان**

**سەر داهێنـان:** سەر داهاوردن؛ قـژی سـەر شـانە کردن ☰ شانه کردن سر

**سەر دە دوو نان:** دوای شتێ کەوتن بە غار ‹تاژی سەری دە دووی کەروێشکێک نـا و گـرتی› ☰ در پی دویدن

**سەر دەرچوون:** سـەر دەرکـردن: ١. تێگەیشـتن؛ زانین؛ فامین ٢. ڕزگار بوون لە بـەلا ☰ ۱. سـر درآوردن؛ فهمیدن ۲. از بلا رستن

**سەر دەرکردن:** ☜ **سەر دەرچوون**

**سەر دەرهێنان:** *[کینایە]* سەر دەرێنان: ١. پەیا بوون ‹ئەمە لە کوێوە سەری دەرهێنا؟› ٢. سەر دەرچوون؛ تێگەیشتن ‹سەر لەم باسە دەرناهێنم› ٣. ڕوان؛ شین بوون ‹کاتێ لە زەوی وەنەوشە سەر دەردێنێ/ سروە دەمی خونچە ماچ بکا و ڕایژێنێ «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ☗ ١. پیدا شدن ٢. وارد بودن ٣. روییدن

**سەر دەرێنان:** ☜ **سەر دەرهێنان**

**سەر زڤران:** سەر زڤرین: ١. گێژ بوون ٢. سەر سووڕمان ☗ ١. سرگیجە گرفتن ٢. مُتحیر شدن

**سەر زڤراندن:** سەر بادان ☗ اظهار ناخشنودی کردن

**سەر زڤرین:** ☜ **سەر زڤران**

**سەر زیقکرن:** سەر دەرێنانی ڕووەک یان زیپکە ☗ بردمیدن گیاه یا جوش

**سەر ژێکرن:** ☜ **سەر برین**

**سەر سپاردن:** *[کینایە]* هاتنە بەر فەرمان ☗ سر سپُردن

**سەر سووڕمان:** *[مەجاز]* دامان؛ سەیر مان ‹سەری سووڕ مابوو ئەو کابرا نەزانە/ چلۆن گۆڕاوە ئەم دەور و زەمانە! «هێمن»› ☗ مُتحیر شدن

**سەر سوک بون:** *[مەجاز]* خەلاس بوون لە کار ☗ فارغ شدن از کار

**سەر شتێ قەولاندن:** *[مەجاز]* گوم و گۆڕ کردن ☗ گم و گور کردن

**سەر شۆڕ کردن:** *[کینایە]* سەر داخستن (لە شەرمان) ☗ سر به زیر افکندن (از خجالت)

**سەر شێوان:** *[مەجاز]* دامان؛ سەرسام بوون ☗ سراسیمە شدن

**سەر قاڵ بون:** *[مەجاز]* سەر نەپەرژان؛ دەرفەت نەبوون ‹سەری زۆر قاڵە، ناتوانێ بێ› ☗ فُرصت نکردن

**سەر قوتان:** *[کینایە]* چوونە دیداری شت ☗ بازدید کردن

**سەر قەبلاندن:** سەرفیترە دان ☗ زکات فطر دادن

**سەر قەولاندن:** *[مەجاز]* لە بەین بردن؛ گوم و گوڕ کردن ☗ گموگور کردن

**سەر کردن:** ١. *[کینایە]* بەراورد کردن ٢. *[مەجاز]* پێ ڕاگەیشتن ٣. لە ئامانج بلندتر لێدانی تیر و گوللە ٤. لاتەرازوو بوون؛ لە لاکەی‌تر گران‌تر بوون ‹پێم دەڵێن: مەحبووبە خێل و قیچە، مەیلی شەڕ دەکا/ خێل و قیچە، یا ترازووی نازی نەختی سەر دەکا؟! «نالی»› ٥. ڕوو تێ کردن ‹لە بەر هەرزانی، خەڵک سەریان کردبووە ئەو دووکانە› ☗ ١. برآورد کردن ٢. رسیدگی کردن ٣. بالاتر از هدف را زدن ۴. سنگین بودن کفەی ترازو ۵. روی نهادن

**سەر کردنە سەر:** ☜ **سەر خستنە سەر**

**سەر کردنەوە:** ١. *[مەجاز]* ترسان لە دەست بە کارێکەوە دان ٢. کاری وەک جۆش دانەوەی سەری ئامرازی کەڵبووی کانزا ٣. *[کینایە]* سەر بردنە ناو ‹سەری کردبۆوە کونی دارەکە› ☗ ١. واهمە داشتن از انجام کاری ٢. جوش دادن قطعە بر سر ابزار فلزی کندە شدە ٣. سر فرو بردن

**سەر کرن:** *[کینایە]* دەمەزەر کردنەوەی گاسن ☗ مرمت کردن لبەهای گاوآهن

**سەر کوڕ کردن:** *[کینایە]* سەر تاشین؛ پرچ بڕین ☗ سر تراشیدن

**سەر کەتن:** ☜ **سەر کەوتن**

**سەر کەفتن:** ☜ **سەر کەوتن**

**سەر کەوتن:** سەر کەتن؛ سەر کەفتن: ١. بەرەژوور چوون ٢. *[کینایە]* بە کام گەیشتن لە دۆز و مەبەستدا ٣. سوار بوون ٤. بردنەوە؛ لە ململانێدا پێش کەوتن ‹دێم و ناترسم لە پەرژینی بەزی/ هەر پەری سەر کەوت و دیوەزمە

بەزی «هێمن»> ■ ١. بالا رفتن ٢. کامیاب شدن ٣. سوار شدن ۴. پیروز شدن

**سەر کێشان**: ١. سەرەتاتکێ کردن؛ بە دزییەوە ڕوانین ٢. [کینایە] کار گەیشتنە رادەیەکی دیاری ٣. هەوساری بارەبەر گرتن لە ڕێگادا ■ ١. سرک کشیدن ٢. به حد معیّنی رسیدن کار ٣. افسار ستور کشیدن در کار

**سەر گرتن**: ١. [کینایە] پێکهاتنی کار ‹خەریک بووم کچەکەی بخوازم، سەری نەگرت «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. میچ لێدان؛ تەواو کردنی خانوو ٣. گرتنی ئاژەڵی مێوینە بۆ نێر ٤. [کینایە] گەوادی کردن ■ ١. فراهم شدن ٢. تمام کردن بنا ٣. گرفتن حیوان ماده برای جفتگیری ۴. جاکشی کردن

**سەر گرتنەوە**: [کینایە] پەیدا کردنەوەی گومبوو و دزراو ■ بازیافتن مال دُزدی

**سەر گەرم کردن**: [کینایە] خلافاندن؛ بە قسە گرتن ‹سەریان گەرم کە تا من دێم› ■ سر گرم کردن

**سەر لە ئاسمان سوان**: [مەجاز] ١. زۆر بڵیند بوون ٢. سەر گەیشتنە ئاسمان؛ هەست بە سەربەرزی کردن ■ ١. مُرتفع بودن ٢. احساس سرفرازی کردن

**سەر لە رێدا بوون**: بە دڵ لە خزمەت کەسێکدا بوون ■ با جان و دل در خدمت کسی بودن

**سەر لە نێو شتێکدا بوون**: [کینایە] خەریکی شتێک بوون ‹دایمە سەری لە نێو کتێبدایە› ■ سر توی چیزی بودن

**سەر لە نێو کەوڵی خۆدا بوون**: [کینایە] خەریکی کاری خۆ بوون و لا لە کەس نەکردنەوە ■ سر توی لاک خود داشتن

**سەر لە هێلکە دەرهێنان**: جووقاندن؛ تازە بە تازە لە هێلکە دەرهاتن ■ تازە سر در آوردن

**سەر لێ بادان**: ١. سەر زڤراندن؛ نارەزایەتی دەربڕین ٢. نافەرمانی لێ کردن ■ ١. اظهار ناخشنودی کردن ٢. از فرمان سرپیچی کردن

**سەر لێ تێکچوون**: ☜ **سەر لێشێوان**

**سەر لێ تێکدان**: ☜ **سەر لێشێواندن**

**سەر لێ خوران**: [کینایە] سەر خوران بۆ شتێ؛ ئارەزووی کارێک کردن ■ هوس کردن

**سەر لێ دان**: [مەجاز] دیەنی کردن ‹غەم سەری لێ دام و یاریش قەت سەرێکی لێ نەدام/ سەبر و هۆشم ڕۆییوە، غارەتگەری دینم نەهات «کوردی»› ■ بازدید کردن

**سەر لێ دانەوە**: [مەجاز] چوونەوە دیدەنی کەسێک ■ بازدید کردن

**سەر لێ دەرچوون**: [مەجاز] سەر لێ دەرکردن؛ تێگەیشتن ■ فهمیدن

**سەر لێ دەرکردن**: ☜ **سەر لێدەرچوون**

**سەر لێ سەندن**: [مەجاز] سەر لێ تێکدان ■ بە اشتباه انداختن

**سەر لێ شێوان**: [مەجاز] سەر لێتێکچوون؛ ڕێ چارە ون کردن ■ سرگشته شدن؛ راه چاره را گم کردن

**سەر لێشێواندن**: [مەجاز] سەر لێتێکدان؛ وە سەر هەڵە خستن ■ به اشتباه انداختن

**سەر لێ کردن**: [مەجاز] ترسان لە دەست بۆ کارێ بردن ■ واهمە داشتن از انجام کاری

**سەر ماسین**: [کینایی] سەر ئەستوور بوون؛ زۆر سەیر بوون و سەر سووڕمان ‹سم، سم کەرە و چنگ، چنگ یاسێ! من لەم کارە سەرم ئەماسێ «مەسەل»› ■ از تعجب سرگیجه گرفتن

**سەر نانە سەر**: ☜ **سەر خستنە سەر**

**سەر نانەوە**: ١. داپۆشینی دەفر ٢. [کینایە] باسی شتێ بڕینەوە؛ چیتر لەسەر شتێ نەڕۆیشتن ٣. ئاوارە بوون ٤. [کینایە] خەوتن ٥. [کینایە] مردن ■ ١. سرپوش بر ظرف گذاردن ٢. سرپوش بر

جریانی گذاشتن ۳. آواره شدن ۴. خُفتن ۵. مُردن

**سەر نیان:** *[کینایە]* ڕۆیشتن و ئاوارە بوون ☰ رفتن و آواره شدن

**سەر و دڵ گرتن:** *[کینایە]* زەحمەت دان ☰ مُزاحم شدن

**سەر و کڵاو تێکەڵ بوون:** *[کینایە]* ئاوقـای یـەک بوون؛ بە شەڕ هاتن ☰ گلاویز شدن

**سەر و مل بۆ شتێک شکاندن:** *[کینایە]* یـەکجار خوازیاری شتێک بوون ‹خەڵکی سەرمابردوو بـۆ تەنەکەیەک نەوت سەر و ملیان دەشکاند› ☰ سر و دست برای چیزی شکستن

**سەر وادان:** ☜ **سەر بادان**

**سەر هاتن:** *[کینایە]* زیاد لە اندازەی پێوست بوون ☰ بیش از اندازەی لازم شدن

**سەر هەڵبرین:** ☜ **سەر هەڵێنان**

**سەر هەڵدان:** ۱. ڕاپەڕین؛ بەرهەڵسـت بوونـەوە ۲. دەرکەوتن؛ پەیدا بوون دوای دیـار نـەبوون ۳. کڵاوەی دەفر لابردن ‹کە دیزەی کەشکەکی هێنا و سەری هەڵدا کەبانووی ماڵ/ زِ تـاب قولـت هەڵمینش چە خـون اُفتـاد در دلهـا «هـەژار، بـۆ کوردستان»› ☰ ۱. قیام کردن ۲. پیدا شدن (کسی یا چیزی) بعد از مُدتی بـیخبـری ۳. سـرِ ظـرف را برداشتن

**سەر هەڵگرتن:** *[کینایە]* ۱. دەرپەڕین و ڕاکـردنی ئەسپ، بێ دەسەڵاتی سوار ۲. چوون و خۆ لـە خەڵک دوور خستنەوە ‹دڵم نایە بە جێـت بێڵـم بڕۆم بۆ خۆم بە دنیادا/ سەری خۆم هەڵـگرم وەک شێت بە کێو و دەشت و سـەحرادا «کـوردی»› ☰ ۱. لجام گُسیختن اسـب ۲. سـر بـە کـوه و بیابـان گذاشتن

**سەر هەڵێنان:** سـەر هەڵـبرین: ۱. سـەر بـەرز کردنەوە ۲. *[کینایە]* سەربزێوی کردن ۳. *[کینایە]* چاکتر بوونی نەخۆش ☰ ۱. سـر بلنـد کـردن ۲. سرکشی کردن ۳. بهتر شدن بیمار

**سەر هەنگاوتن:** دەسـت لـە سـەر دانـان بـۆ ڕێزگرتنی کەسێ ☰ دست بر سـر نهـادن بـرای احترام

**سەر هێنـان و سەر بـردن:** *[کینایە]* بـیر کردنـەوە ‹هەرچی سەرم هێنا و سەرم برد، ئەم کارە سوودی نەبوو› ☰ بسیار فکر کردن

**سەری خۆ خوێندنەوە:** *[مەجاز]* حیسابی خۆ کردن ☰ خود را برآورد کردن

**سەری شتێک گرتن:** لایـەکی شـتێک گرتنـە دەستەوە ‹سەری مێزەکە بگـرە بـا بیبـەین!› ☰ سر چیزی را گرفتن

**سەری شتێک هێنانە یەکد** جەم کردنەوەی سەری شـتێک ‹سـەری تەلیسـەکەمان هێنایـە یـەک و گرێمان دا› ☰ سر چیزی را هم آوردن

**سەری قسە داخستن:** ☜ **سەری قسە داهێنان**

**سەری قسە داهێنان:** *[مەجاز]* سەر قسە داخسـتن؛ دەست بـە قسـە کـردن ‹لەگـەڵ هاوسـێکەمان سەری قسەم داهێنا› ☰ سر حرف را باز کردن

**سەری کەسێک بردن:** *[مەجاز]* مێشـکی سـەری کەسێک بردن/ خواردن؛ بە زڵـە و چەنـەبازی کەسێک ئازار دان. هـەروەها: **سەری کەسێک چوون** ☰ سر کسی را بردن

**بە سەر چوون:** ۱. ڕابـردن؛ گـوزەران ‹وا دیـارە بەشی قوتابخانە چوونم بـە سـەر چووبـوو «هـەژار، چێشـتی مجێـور»› ۲. *[مەجاز]* زۆر بـە تاسـە و مەراقەوە بۆ شوێنێ یا لای کەسێک چوون ‹بۆ لای تۆ بە سەر دێم› ☰ ۱. گذشتن ۲. با سر آمدن

**بە سەردا هێنان:** *[کینایە]* تووشیار کردن؛ کەسێک تووشی شتێکی نەخوازراو کردن ‹بەڵا بە سەردا هێنان؛ گۆڕانکاری بـە سـەردا هێنـان› ☰ بـر سـر آوردن

**بە سەر کردنەوە:** *[مەجاز]* سەر لێ دان؛ ئـاوڕ لـێ

دانەوە 🇮🇷 سر زدن

**بە سەر کەسێکدا هاتن:** /کینایە/ کەسێک تووشی شتێکی نەخوازراو هاتن ‹نازانی لەو ساڵانەدا چیم بە سەرا هات!› 🇮🇷 بە سر کسی آمدن

**بە سەروە هاتن:** /مەجاز/ بە حەز و لەزەوە هاتن 🇮🇷 با سر آمدن

**بە سەری کەسێک سوێند/ قەسەم خواردن:** ١. بە دروستی و ڕاستی کەسێکدا پەرمیان ‹هەموو بە سەری سوێند دەخۆن، تۆ دەڵێی دزە؟› ٢. بە نیشانەی ڕێزنان، بە سەر (گیان)ی کەسێک سوێند خواردن ‹بە سەرت سوێند دەخۆم من بێخەبەرم› 🇮🇷 ١و٢. به سر کسی قسم خوردن

**لە ژێر سەردا بوون:** /مەجاز/ ١. نانەوە؛ زووتر شک بردن ‹پارەیەکی باشی لە ژێر سەردایە› ٢. لە بیر و هزردا وەک ئاوات و خولیایەک بوون ‹حەمدی سەودایی چلۆنی وا لە ژێر سەردا، سەرت/ ناوی ئەو شۆخە دەنووسێ شەو لە خشتی ژێر سەرا «حەمدی»› 🇮🇷 ١. زیر سر داشتن ٢. در سر پرواندن

**لە ژێر سەری کەسێکدا بوون:** /مەجاز/ کەسێک هۆی کارەساتێک بوون ‹ئەم هەموو شەڕ و ئاڵۆزییە لە ژێر سەری شەریکەکەیدایە› 🇮🇷 زیر سر کسی بودن

**لە سەردا بوون:** لە هزر و بیردا بوون ‹هەر کەسە خەیاڵێکی لە سەردایە› 🇮🇷 در سر داشتن

**لە سەر دان:** /مەجاز/ لە کتوپڕ بیرێکی سەیر بە خەیاڵدا هاتن ‹داویە لە سەرم هەوای یاری نۆ/ یا بۆ وەیس ئەچم یا بۆ باینچۆ «فولکلۆر»› 🇮🇷 به سر زدن

**لە سەر دەرکردن:** /مەجاز/ لە بیر خۆ بردنەوە ‹مەیگێڕ لە مە بڕوانە بە سیلەی چاوێ/ ڕابردوو، نەهاتوو، لە سەرت دەرباوێ «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› 🇮🇷 از سر بیرون کردن

**لە سەر کردنەوە:** /کینایە/ پشتیوانی و بەرگری لێ کردن ‹چا بوو، سێ چوار کوڕە پوورم لەو مەدرەسە دەیانخوێند و لە سەریان دەکردمەوە «هێمن»› 🇮🇷 دفاع کردن

**لە سەر کەوتن/ دەرچوون:** /کینایە/ لە بیر چوونەوە و لێی نەکۆڵینەوە 🇮🇷 از سر افتادن

**لە سەر گرتنەوە:** دەسپێکردنەوە؛ دیسانەوە درێژە دان ‹لە سەر گرتنەوەی وتووێژەکان› 🇮🇷 از سر گرفتن

**لە سەر وەستا بوون:** ١. لە لای وەستاکار بوون بۆ چاک کردنەوە ‹ماشینەکەم لە سەر وەستایە› ٢. /مەجاز/ نزیک لە مردن بوون ‹زۆر نەخۆشە، لە سەر وەستایە› 🇮🇷 ١. پیش اُستادکار بودن ٢. در شُرُف مرگ بودن

**لە سەری کەسێ زیاد بوون:** /کینایە/ زۆرتر لە نیاز یان بایەخی کەسێک بوون 🇮🇷 از سر کسی زیاد بودن

**سەر**[٢]: ئاوەڵناو. ١. باڵا؛ بان؛ ژوور؛ سەروو ‹ماڵیان لە گوندی سەرە؛ قاتی سەر› ٢. سەرتر؛ خاوەن تایبەتمەندییەکی بەرزتر ‹قسەی قوێخا سەرە› 🇮🇷 ١. بالا ٢. برتر

▣ **سەر خستن:** ١. بردنە سەرەوە ‹سەر خستنی وڵات؛ لە پەنجەرەوە سەر خستن› ٢. /کینایە/ دەسگیرۆیی کردن و بە ئاوات گەیاندن ٣. سوار کردن ‹لە ماشینەکە سەریان خستم و چاویان بەستم› ٤. بە ئەنجام گەیاندن؛ بە ڕێوە بردن؛ بە ئاکام گەیاندن ‹سەر خستن و ساز دانی کۆنگرەی نەتەوەیی› ٥. کار و ڕەوتی هەناردنی دەیتا ئەلەکترۆنییەکان لە کەمپیوتەرێکەوە (کەسێ) بۆ کەمپیوتەرێکی تر (پتر سێرڤێر) ‹سەر خستنی فایلی وێنە› ٦. بوونە هۆی سەرکەوتن ‹پاڵپشتییان لێ کرد و بە سەر دوژمندا سەریان خست› 🇮🇷 ١. بالا بردن ٢.

بە جایی رساندن ٣. سوار کردن ۴. بە انجام رساندن ۵. ئاپلَود کردن ۶. پیروز کردن

**سەر**[٣]: ئاوەلکار. بەرەو بان؛ بۆ ژوورەوە ‹بەرەو سەر برۆ؛ بۆ سەر دەڕوانم› ☰ بالا

◘ **بردنە سەر**: لە ئاستێکەوە گواستنەوە بۆ ئاستێکی بان‌تر. هەروەها: **خستنە سەر؛ کێشانە سەر؛ هاتنە سەر؛ هاوردنە سەر؛ هێنانە سەر** ☰ بالا بردن

**سەر**[٤]: ئامراز. سەری: ١. دەسپێکی ‹سەر وەخت› ٢. لە سەر ‹سەر کێف› ٣. لە نێو ‹سەر ماڵ› ٤. لە کاتی ‹سەر شام؛ سەر ئێوارە› ٥. لە سەر ‹سەر چە کایە بکەین؟› ٦. لە سەری ‹سەر تیری› ٧. جم؛ کن؛ نک؛ لا ‹بردمە سەر وەستا› ☰ ١. سرِ ٢. بالای ٣. توی ۴. هنگامِ ۵و۶. سرِ ٧. کنارِ؛ نزدِ

◘ **سەر لە**: دەسپێک ‹سەر لە بەیانی› ☰ آغاز

**لە سەر**: لە بەر؛ بە خاتری ‹لە سەر تۆ بوومە پەندی عالەمیٚ› ☰ بە خاطرِ؛ برای

◘ **(لە) سەر خۆ چوون**: ١. بوورانەوە؛ بێهۆش بوون ٢. بایی بوون ☰ ١. از حال رفتن؛ بیهوش شدن ٢. مغرور شدن

**سەر خۆ هاتن**: هاتنە سەر خۆ؛ لە کزی و نەخۆشی ڕزگار بوون ☰ سر حال آمدن

**سەر**[٥]: پێشوشە. سەروو ‹سەربەرز؛ سەرکردە؛ سەرچل› ☰ سر-

▪ **سەر**[٦]: پاشەوشە. ١. بیر ‹خۆسەر› ٢. ڕاس؛ ڕاست ‹یەکسەر› ☰ ١. ـ رای ٢. مستقیم

▪ **سەر**[٧]: پاشگر. شوێن ‹ڕوانسەر؛ ئاویسەر› ☰ جای؛ سرای

**سەرئاسنینە** / ser'as(i)nîne/: ناو. سەپان‌ترێنە؛ دڕووەکەڵەوە؛ چۆکشکێنە؛ جۆریٚ دڕکی تیژە، لە نێو گەنمدا دەڕویٚ ☰ نوعی خار

**سەرئاسیٚ** / ser'asê/: ☜ **سەراسیٚ**

**سەرئاواڵە** / ser'awałe/: ئاوەڵناو. سەرباز؛ سەرگوشاد ☰ سرباز

**سەرئاورگە** / ser'awirge/: ناو. سەرکل ☰ بالای آتشدان

**سەرئەژمێر** / ser'ejmêr/: ☜ **سەرژمێر**

**سەرئەژمێری** / ser'ejmêrî/: ☜ **سەرژمێری**

**سەرئەنجام**[١] / ser'encam/: ناو. سەرەنجام: ١. دوایی؛ دواخری؛ ئاخر؛ دەس‌ئاخر؛ قۆناغی دوایینی ڕەوتێک ‹سەرئەنجام گا، هەر دۆڵە «مەسەل»› ٢. ئاکام؛ بڕانەوەی کار؛ بەرهەم و دەسهاتی چالاکییەک ‹سەرئەنجام چ دەبیٚ، کەس نازانیٚ› ☰ ١و٢. سرانجام

**سەرئەنجام**[٢]: ئاوەلکار. سەرەنجام؛ لە دواییدا؛ دواخرەکەی ‹بە هەر جۆریٚ بوو وازیان لیٚ هێنام/ کەوتمە فکری خۆم، ئاخر سەرئەنجام «قانع»› ☰ سرانجام

**سەرئەنداز** / ser'endaz/: ناو. سەرئەنناز: ١. سەرپۆش؛ ئەوەی بە سەری شتێکیدا دەدەن ٢. ڕایەخی باریک کە کەنار دیوار پڕ دەکاتەوە ☰ ١. سرپوش ٢. کنارە

**سەرئەنگوست** / ser'engust/: ☜ **سەرپەنجە**

**سەرئەنناز** / ser'ennaz/: ☜ **سەرئەنداز**

**سەرئێشە** / ser'êşe/: ناو. سەرێشە؛ ژانەسەر ☰ سردرد

**سەرئێوارە** / ser'êware/: ناو. سەرەتای درەنگ بوونی ڕۆژ ☰ عصرهنگام

**سەرا**[١] / sera/: ناو. ١. ماڵی دیوان ٢. جێگە ‹سەرای دەوڵەتی› ☰ ١. ادارەی مرکزی ٢. جای؛ مکان

▪ **سەرا**[٢]: پاشەوشە. جیٚ ‹کاروانسەرا› ☰ ـ سرا

**سەراپا** / serapa/: ئاوەلکار. سەراپیٚ؛ سەرلەبەر؛ سەر تا پیٚ: ١. لە سەر تا پیٚ؛ هەموو ئەندام ‹شێخیی و سەراپا دەڵەک و ڕێوی دەپۆشی/ نالیم و بە ڕووتیٚ لە هەموو دیدە دەپۆشم «نالی»› ٢.

سەراسەر؛ گشت لە گشت؛ بە تەواوی ‹سەر و ڕیشم سەراپا بۆتە لۆکە/ بە شەو هەمرازمە پشمین و کۆکە «حاجی قادر»› ⯀ ١و٢. سراپا

**سەراپەردە / seraperde/:** ناو. دیوانی میر ⯀ خانەی فرمانروا

**سەراپیتە / serapîte/:** ناو. میچ؛ سرمیچ؛ بنمیچ؛ بان لە دیوی ژوورەوە ⯀ سقف

**سەراپێ[١] / serapê/:** ئاوەڵناو. هۆشیار؛ لە سەر هۆش ⯀ هوشیار

**سەراپێ[٢]:** ☜ سەراپا

**سەراراو / seraraw/:** ناو. کەفاوی تازەی لە کار نەکراوی شۆردنی جلوبەرگ ⯀ کفابەی استفادە نشدەی رختشویی

**سەرازا / seraza/:** ئاوەڵناو. سەربەست؛ ئازاد ⯀ آزاد

**سەرازادی / serazadî/:** ناو. سەرازایی؛ ئازادی ⯀ استقلال

**سەرازایی / serazayî/:** ☜ سەرازادی

**سەراسا[١] / serasa/:** ئاوەڵناو. تایبەتی ⯀ اختصاصی

**سەراسا[٢]:** ☜ سەرانسەر

**سەراسایی / serasayî/:** ☜ سەرانسەری

**سەراسوێ / seras(i)wê/:** ناو. سەراسۆ؛ کاری لە بەرزترەوە ڕوانین بە نهێنی ⯀ عمل دزدکی از بالا نگاه کردن

**سەراسۆ / seraso/:** ☜ سەراسوێ

⊡ **سەراسۆ کردن:** ١. مل کێشان و چاو لێکردن ‹بچۆ سەر ئەو بستووکە سەراسۆیێ بکە! بزانە کەس دیار نییە› ٢. سەر دان؛ بە سەر کردنەوە ‹قەت سەراسۆیەکمان ناکەی› ⯀ ١. دید زدن ٢. ملاقات کردن

**سەراسەر / seraser/:** ☜ سەرانسەر

**سەراسەری / seraserî/:** ☜ سەرانسەری

**سەراسیمە / serasîme/:** ئاوەڵناو. شڵەژاو؛ سەرلێشێواو؛ حەپەساو بە هۆی ڕووداوێکی لەنەکاو ⯀ سراسیمە

**سەراسێ / serasê/:** ناو. سەرئاسێ؛ شیشەنگ؛ لاژانەسەر؛ ژانەسەرێکی تیژی تاوتاوە، نەخۆش دادەگرێ و تێکی دەدا ‹سەرێ سەراسێ نەگرێ بۆ ولات/ هاواری لێ کەی نەگاتە فریات «قانع»› ⯀ میگرن

**سەراشێت / seraşêt/:** ناو. سەرئێشەی چەلومل و دەستبەرنەدەر ⯀ سردرد مُزمن

**سەراڤ / serav/:** ناو. سەراڤک؛ سەراو: ١. کیسە ئاوێ کە دەگەڵ پیزە لە سکدایە ٢. قەراخ ئاو ⯀ ١. کیسەآب همراه جنین ٢. کرانە

⊡ **سەراڤ پەقین:** سەراو تۆقین؛ سەراو تەقین؛ ڕژانی ئاوی سەراڤ بەر لە هاتنی مناڵ ⯀ پارە شدن کیسەآب قبل از تولد نوزاد

**سەراڤک / seravik/:** ☜ سەراڤ

**سەراڤکانێ / seravkanê/:** ناو. گەمە لە ئاوی قووڵدا و سەر دە ئاو ڕۆکردنی یەکتر ⯀ آب بازی هنگام شنا

**سەراڤکی / seravkî/:** ئاوەڵکار. ڕەپوڕاست؛ بە ئاشکرا؛ بێ دەروایی ⯀ رُک و صریح

**سەراڤی / seravî/:** ئاوەڵناو. پاش بارانی پەڵە چێندراو (دەغل) ⯀ کاشتە شدە پس از اوّلین باران جدّی پاییزی (بذر)

**سەراک / serak/:** ناو. کولکەی بە شانەکراو ⯀ پشم و موی شانەزدە و پاک شدە

**سەراگوم / seragum/:** ئاوەڵناو. ١. شرت و گوم؛ بێسەروشوێن ٢. کەسنەناس ⯀ ١. مفقودالاثر ٢. گُمنام

**سەرالیچی / seralîcî/:** ناو. سەرنشێو ⯀ سرازیری

**سەرامەت / seramet/:** ☜ سەرامەد

**سەرامەد / seramed/:** ئاوەڵناو. سەرامەت؛ گرۆبەر؛ هەڵکەوتە؛ ژیهاتی؛ موودە؛ سەرتر لە هەموان ⯀ سرآمد

**سەرامیک / seramîk/**: ناو. سـرامیک؛ کاشـی؛ بەرهـەمی سواڵـەتی بـە خاکەبـەرد و کـائولین تۆژدراو ☰ سرامیک

**سەرانسەر / seranser/**: ئاوەڵکار. سەراسـا؛ سەراسـەر؛ سەرتاسـەر؛ سەراسـا: ١. پەڕانپـەڕ؛ شەقانشەق؛ لـەم سـەر تـا ئـەو سـەر ‹زستانێکی سەرانسەر، پێخۆرمان نەبوو، بە نانی وشک ڕامانبوارد «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. گـش؛ هـەموو ☰ ١. سراسر ٢. همگی

**سەرانسەری / seranserî/**: ئاوەڵناو. سەراسـەری؛ گشـتی؛ سەراسـایی؛ پێوەندیـدار بـە هـەموو شوێنێکەوە ☰ سراسری

**سەرانگوێلک / serang(i)wêlik/**: ناو. سـەرانگۆلک؛ سـەرانوێلک؛ سـەرگوێلک؛ سـەرگۆ؛ سـەروانک؛ سـەرەنوێلک؛ سـەنگوردوو؛ سـەنێرگا؛ سـەنیرگا؛ سەنێروانک؛ سـەنێروانگ؛ سـەورگە؛ سـەخوڕگە؛ سەورۆگا؛ گووفک؛ لاسـگا؛ گیفـەلانک؛ سـنێرگە؛ جێگەی لێڕشتنی پەین و ڕیخ ☰ شوله؛ سرگینگاه

**سەرانگۆلک / serangolik/**: ☜ **سەرانگوێلك**

**سەرانگێڕۆ / serangêro/**: ناو. کـاری گەڕانـەوە لـە سەردا بۆ خوار ‹هەوارچییان لە کوێستانەوە مالاتیان سەرانگێڕۆ کردووە› ☰ عمل به پایین برگشتن

**سەرانوێلک / seranwêlik/**: ☜ **سەرانگوێلك**

**سەرانە[1] / serane/**: ☜ **سەرباقی[1]**

**سەرانە[2]**: ئاوەڵناو. پێوەندیـدار بـە هـەر کەسـەوە ‹داهاتی سەرانە› ☰ سرانه

**سەرانە[3]**: ئاوەڵکار. بە پێی سەر؛ بۆ هـەر کەسـێک ‹سەرانە دابەش دەکرێ› ☰ سرانه

**سەراو[1] / seraw/**: نـاو. ١. چـاوەی زلی ئـاو ٢. سەراڤ؛ زەمینی نزیکی چەم ٣. سـەراڤ؛ کیسـە ئاوێ کە دەگەڵ پیزە لـە سـکدایە ٤. ئاودەسـت؛ دەساو ٥. یەکەمین ئاوێ کـە بـە کشـت و کـاڵ دەدرێ ☰ ١. سرچشمه ٢. زمین نزدیک رودخانـه ٣. کیسه‌آب همراه جنـین ۴. مُسـتراح ۵. اوّلـین آبیـاری مزرعه

▣ **سەراو تۆقین**: ☜ **سەراف پەقین**

**سەراو تەقین**: ☜ **سەراف پەقین**

**سەراو کردن**: بۆ یەکەم جار دێرانی کشت و کاڵ ☰ آبیاری کردن مزرعه برای اوّلین بار

**سەراو[2]**: ئاوەڵناو. ١. بناو نـەبوو؛ خۆگرتـوو لـە بـان ئاوەوە ٢. تایبەتمەندی زەمینێ کە زوو ئاو قووت نادات ☰ ١. شناور ٢. حالت زمینی کـه آب را سـریع جذب نمی‌کند

**سەراوان / serawan/**: ناو. لای سـەرەوە ☰ طـرف بالا

**سەراورد / serawird/**: ☜ **سەراوەرد**

**سەراوەرد / serawerd/**: نـاو. سـەراورد: ١. ڕابواردووی لەمێژینە ٢. لای ژوورینی مەزرا ☰ ١. گذشتەی دور ٢. سمت بالای زمین کشاورزی

**سەراوی / serawî/**: ناو. جۆرێ کوولەکـە ☰ نـوعی کدو

**سەرایت / serayit/**: ناو. ستیرمە؛ گیرۆیی؛ تەشـەنا ☰ سرایت

**سەربار[1] / serbar/**: ناو. سەربارە؛ سەروار: ١. شـتێ کە لە سەر بـاری بارەبـەر یـان بـار بـە تێکـڕایی دادەنرێ ٢. /کینایە/ زەحمەتی زیادی ‹لـە سـایەی زەحمـەت و ڕەنـج و لـە سـایەی کـار و ئـازایی/ بـە سەربەرزی دەژین، بۆ کۆمـەڵ و گـەل نابنـە سـەربار «هێمن»› ☰ ١. اضافەبار ٢. قوزبالاقوز

**سەربار[2]**: ئاوەڵناو. هۆی دەردیسەری و ڕەنجی زۆر ‹بێچاوییە هۆی کزی و کەساسیت/ سەرباری خەڵک بی، نالەباری «مەلا غەفوور»› ☰ سربار

**سەربارانە / serbarane/**: ناو. ١. کاری باج سەندن لە باری کـاروان ٢. باجـێ کـە بـە پێـی بـار لـە کاروانچی دەسـەندرێ ☰ ١. عمـل بـاج گـرفتن از بارهای کاروان ٢. باج بار

**سەرباره / serbare/:** ☜ **سەربار¹**

**سەرباز¹ / serbaz/:** ناو. سەرواز؛ باڵباز: ١. کەسێ کە لە هێزی چەکداری، بەتایبەت ئەرتەشدا خزمەت دەکا و خوارترین پلەکی چەکداری هەیە ٢. *[کینایە]* کەسێ کە بۆ شەڕکردن ئامادەی چەک هەڵگرتنە ‹سەربازی نیشتمان؛ سەربازی ڕێگەی ڕزگاری› ٣. پیادە؛ داشێکی شەترەنج ٤. وەرەقێکی کایەی پاسوور ≡ ١تا٤. سرباز

▣ **سەرباز گرتن:** خەڵک بە زۆر بۆ سەربازی بردن ≡ سرباز گرفتن

**سەرباز²:** ئاوەڵناو. سەرواز: ١. سەرئاواڵە؛ سەرتاک ٢. سەرڕێژ؛ لیپ ≡ ١. سرگُشاده ٢. لبریز

**سەربازخانە / serbazxane/:** ☜ **سپاخانە**

**سەربازگە / serbazge/:** ناو. دەبۆ؛ سپاخانە ≡ پادگان

**سەربازگیری / serbazgîrî/:** ناو. سەروازگیری؛ سەروازبگیر؛ کاری سەرباز گرتن ≡ سربازگیری

**سەربازی / serbazî/:** ناو. سەروازی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی سەرباز بوون ٢. ماوەیێ کە هەر کەس دەبێ وەک سەرباز، لە هێزی چەکداری بێگار بکا ≡ ١و٢. سربازی

▣ **سەربازی کردن:** بۆ ماوەیەکی دیاریکراو لە هێزی چەکداریدا خزمەت کردن ≡ سربازی کردن

**سەرباس / serbas/:** ناو. بابەتی قسە و گفتوگۆ ‹سەرباسی کەناڵەکانی جیهان› ≡ محور بحث

**سەرباقی¹ / serbaqî/:** ناو. سەرانە؛ سەر؛ باقی؛ پاشماوە؛ ماوە؛ ئەوەی بە هۆی جیاوازی نرخی دوو شت، دەدرێ یان وەردەگیرێ ‹ساعەتەکانمان گۆڕییەوە، سیهەزارم سەرباقی داوە› ≡ باقی

**سەرباقی²:** ئامراز. ١. سەرەڕای ‹سەرباقی تەواوی گرفتاری ژیان، ڕووی خۆش بوو› ٢. لە هەمبەر؛ لە باتی ‹سەرباقی چاکە و پیاوەتیم، بوختانم بۆ هەڵدەبەستێ!› ≡ ١. با وجودِ ٢. در عوضِ

**سەربال / serbał/:** ناو. شاپەڕ؛ شاباڵ؛ پەڕی درشتی مەل ≡ شاهپر

**سەربان / serban/:** ناو. سەربوو؛ بان؛ بانماڵ؛ بانخانگ؛ بانبەرز؛ دیوی دەرەوەی سەرپۆشی خانوو ≡ پُشتبام

**سەربدەو / serbidew/:** ناو. دۆکلیوی بە برنج و ساوار ≡ آش بلغور و دوغ

**سەربردە / serbirde/:** ناو. سەربگرد؛ سەربووری؛ سەربهوردە؛ سەربهوردی؛ سەربهوورد؛ سەرگوت؛ بەسەرهات ≡ سرگذشت

**سەربرین / serb(i)rîn/:** ئاوەڵناو. کەچەڵ ≡ کَل

**سەربڕ¹ / serbiř/:** ناو. کەسێ کە سەر دەبڕێ ≡ جلاد

**سەربڕ²:** ئاوەڵناو. ١. قەوبڕ؛ ناڤبڕ؛ نێوبڕ؛ نزیکترین ڕێ بۆ گەیشتن ٢. تایبەتمەندی گەنم، جۆ، وێنجەی دووراو و ... بە ماڵەغان، بە شێوەیێ کە سەری گوڵەکەی بقرتێنن ‹ئەو وێنجەیە حەیفە، سەربڕ مەیدوورە!› ≡ ١. میانبُر ٢. نزدیک بە خوشە درو شدە (گندم، جو، یونجە و ...)

**سەربڕانە / serb(i)řane/:** ناو. ئاهەنگی حەیوان سەربڕین و میوانداری بە هۆی تەواو بوونی کاری وەرزێری ≡ قربانی کردن و سور دادن بە مناسبت پایان کار کشاورزی

**سەربڕاو / serb(i)řaw/:** ئاوەڵناو. سەربڕیاگ؛ سەر بە تیغ جیاوەکراو ≡ سربُریدە

**سەربڕیاگ / serbiřyag/:** ☜ **سەربڕاو**

**سەربزۆت / serb(i)zot/:** ☜ **سۆتك**

**سەربزۆک / serb(i)zok/:** ئاوەڵناو. بزۆز؛ هاروهاج ≡ ناآرام

**سەربزۆکی / serb(i)zokî/:** ☜ **سەربزێوی**

**سەربزووت / serb(i)zût/:** ☜ **سۆتك**

**سەربزێو / serb(i)zêw/:** ئاوەڵناو. ١. سەربزۆک؛ بزۆز ٢. *[کینایە]* ئەشقی؛ یاخی ≡ ١. ناآرام ٢.

سرکش

**سەربزێوی / serb(i)zêwî/**: ناو. سەربزۆکی؛ یاخییەتی؛ ئەشقییەتی 🇮🇷 یاغیگری

**سەربگرد / serbigird/**: ☜ **سەربردە**

**سەربلور / serb(i)lûr/**: ناو. جۆرێ ماسی دەم درێژۆکەی وەک بلوێر 🇮🇷 نوعی ماهی

**سەربڵن / serb(i)łin/**: ☜ **سەربڵند**

**سەربڵند / serb(i)łind/**: ئاوەڵناو. سەربڵن؛ ئابڕوودار. هەروەها: **سەربڵندی** 🇮🇷 سرفراز

**سەربو / serbû/**: ☜ **سەربان**

**سەربوری / serbûrî/**: ☜ **سەربردە**

**سەربە / serbe/**: ئامراز. پێوەندیدار بە؛ سەبارەت بە ‹سەربە دەوڵەت› 🇮🇷 منسوب به؛ وابسته به

**سەربەتاڵ / serbetał/**: ئاوەڵناو. ١. بێسەرپۆش ٢. نەزان و بێئاوەز 🇮🇷 ١. بی‌سرپوش ٢. بی‌مغز

**سەربەخۆ[1] / serbexo/**: ئاوەڵناو. ١. بژێک؛ بژێو؛ خۆژی؛ خۆژیو؛ خاوەن سەربەستی و دەسەڵات ٢. جیاواز؛ جیا؛ جوێ ٣. *[رامیاری]* تایبەتمەندی حوکمەتێک کە بۆخۆی بڕیاری خۆی دەدا و بەڕێوە بردنی قانوون و لە باری ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە، چاو لە دەستی غەوارە نییە و ٤. ☜ **سەربەردایی** 🇮🇷 ١تا٣. مُستقل ٤. ☜ **سەربەردایی**

**سەربەخۆ[2]**: ئاوەڵکار. خۆسەر؛ بۆخۆ؛ بێ پرس لە کەسی دی ‹شووەکەی سەربەخۆ خانووەکەی فرۆشتبوو› 🇮🇷 سرخود

**سەربەخۆیی / serbexoyî/**: ناو. سەربەستی؛ خۆبوویی؛ سەرازایی؛ دۆخ یا چۆنیەتی کار بە کەسێکی‌تر نەمان؛ بڕیار دان، لەسەر کار کردن و بەڕێوە بردنی کاران بە تەنیا یان لە ژێر چاوەدێری خۆدا ‹کوردستانم بە گۆڕەپان دیتە بەرچاو/ سەربەخۆیی بە تۆپێکی باش پەفدراوا «پەشێو»› 🇮🇷 استقلال

**سەربەدوو / serbedû/**: ناو. چێشتی کەشک و گەنمە کوتاو 🇮🇷 آش کشک و گندم نیمکوب

**سەربەدەرەوە / serbederewe/**: ئاوەڵناو. بەناوبانگ؛ ناودێر؛ بەدەنگ‌وناو 🇮🇷 مشهور

**سەربەران / serberan/**: ناو. بەرانێ کە تەمەنی لە پێنج ساڵ پتر بێ 🇮🇷 قوچ پنج ساله بیش

**سەربەردایی / serberdayî/**: ئاوەڵناو. خۆسەر؛ سەربەخۆ؛ خودسەر؛ لاسار؛ خۆڕایی؛ کێزر؛ بێخۆ؛ لە خۆخڕە؛ سەربزێو؛ خووگرتوو بەوەی کە قسە هەر قسەی خۆی بێ 🇮🇷 خودسر

**سەربەردە / serberde/**: ناو. بانیژە؛ شوێنی گەنم تێ کردنی ئاش 🇮🇷 دهانەی آسیاب

**سەربەرز / serberz/**: ئاوەڵناو. سەربڵن؛ سەربڵند؛ سەرفیراز؛ سەرفەراز؛ سەرەفراز 🇮🇷 سرفراز

**سەربەرزی / serberzî/**: ناو. ١. سەربڵندی ٢. شانازی 🇮🇷 ١. سرفرازی ٢. افتخار

**سەربەرگەدە / serbergede/**: ناو. بەرکەمەر؛ بەرناوک؛ ژێری ناوک 🇮🇷 زیر ناف

**سەربەرەخوار[1] / serberex(i)war/**: ناو. سەربەرەوخوار؛ سەربەرەوخوارە؛ سەربەرەژێر؛ سەربەرەژێرکە؛ سەربەرەژێرە؛ سەربەرەوژێرە؛ سەربەرەوژێر؛ سەرەو لێژایی؛ ڕووبە لای ژێروو ‹لەمەو بە دوا سەربەرەخوارە› 🇮🇷 سراشیبی

**سەربەرەخوار[2]**: ئاوەڵناو. سەربەرەوخوار؛ سەربەرەوخوارە؛ سەربەرەژێرکە؛ سەربەرەژێر؛ سەربەرەژێرە؛ سەربەرەوژێرە؛ سەربەرەوژێر؛ سەرەو لێژایی ‹ڕێگەی سەربەرەخوار› 🇮🇷 سراشیبی

**سەربەرەخوار[3]**: ئاوەڵکار. سەربەرەوخوار؛ سەربەرەوخوارە؛ سەربەرەژێرکە؛ سەربەرەژێر؛ سەربەرەژێرە؛ سەربەرەوژێرە؛ سەرەو لێژایی؛ سەربەرەوژێر؛ بەرەو لای خوارەوە ‹سەربەرەخوار چوو› 🇮🇷 رو به پایین

**سەربەرەخوارە / serberex(i)ware/**: ☜

سەربەرەخوار

**سەربەرەژوور**[1] / serberejûr/: ناو/ ئاوەڵناو. سەربەرەوژووره؛ سەربەرەوژوور؛ بەرەوژووره؛ سەرەوژوورایی ☰ سربالایی

**سەربەرەژوور**[2]: ئاوەڵکار. سەربەرەوژووره؛ سەربەرەوژوور؛ سەرەوژوورایی؛ بەرەو ژوور؛ ڕوو بە بان؛ بەرەو لای سەرەوە ‹سەربەرەژوور بڕۆن تا دەگەنە دوو ڕیانێ، ئەوجار بە لای ڕاستا هەڵگەڕێن› ☰ رو به بالا

**سەربەرەژێر**[1] / serberejêr/: ☜ سەربەرەخوار

**سەربەرەژێر**[2]: ئاوەڵناو. [کینایە] شەرمەزار و خەجاڵەت ☰ سرافکنده

**سەربەرەژێرکە** / serberejêrke/: ☜ سەربەرەخوار

**سەربەرەژێرە** / serberejêre/: ☜ سەربەرەخوار

**سەربەرەژێری** / serberejêrî/: ناو. سەرنشێو؛ سەربەرەژێر؛ سەرەوخوارکە ☰ سراشیبی

**سەربەرەوبان** / serberewban/: ئاوەڵناو. بەرەوژوور ‹ڕێگایەکی سەربەرەوبانمان بڕی› ☰ سربالا

**سەربەرەوخوار** / serberewx(i)war/: ☜ سەربەرەخوار

**سەربەرەوخوارە** / serberewx(i)ware/: ☜ سەربەرەخوار

**سەربەرەوژوور** / serberewjûr/: ☜ سەربەرەژوور

**سەربەرەوژوورە** / serberewjûre/: ☜ سەربەرەژوور

**سەربەرەوژێر**[1] / serberewjêr/: ☜ سەربەرەخوار

**سەربەرەوژێر**[2]: ئاوەڵناو. سەرەوژێر؛ قڵپ؛ وێران؛ کاول ☰ زیر و زبر

**سەربەرەوژێرە** / serberewjêre/: ☜ سەربەرەخوار

**سەربەرەولێژایی** / serberewlêjayî/: ☜ سەرنشێو

**سەربەڕسق** / serbeřisq/: ئاوەڵناو. ١. سەربەڕۆزی؛ خاوەن ڕسق و ڕۆزی ٢. [کینایە] خۆشبەخت؛ کامەران ٣. پیرۆز ☰ ١. دارا ٢. خوش‌شانس ٣. خوش‌یُمن

**سەربەڕۆزی** / serbeřozî/: ☜ سەربەڕسق ـ١

**سەربەڕۆنە** / serbeřone/: ناو. چێشتی دانەوێڵەی خەستوخۆڵ کە ڕۆنی قرچاوی بە سەردا دەکەن ☰ آش غلیظ حبوبات و روغن داغ

**سەربەڕوو** / serbeřû/: ناو. جۆرێ مارە، سەری وەک بەڕوو دەچێ ☰ نوعی مار

**سەربەڕووڵە** / serbeřûłe/: ناو. پیمێکە گاینجە ڕادەگرێ ☰ پیمی چوبی در خیش

**سەربەزیا** / serbezîa/: ☜ سەروزیاد

**سەربەزێرە** / serbezêre/: ناو. لەبزەرینە؛ نیسکێنەی توند کە ڕۆنی قاڵکراوی بە سەردا دەکەن ☰ آش عدس غلیظ که روغن بر آن ریزند

**سەربەزێڕە** / serbezêře/: ناو. لەبزێرینە؛ نیسکێنەی توند کە ڕۆنی داخی بە سەردا دەکەن ☰ آش غلیظ عدس با روغن داغ

**سەربەژێر** / serbejêr/: ئاوەڵکار. بەرەوخوار؛ نشێو؛ سەربەژێر ☰ رو به پایین

**سەربەس** / serbes/: ☜ سەربەست

**سەربەست**[1] / serbest/: ئاوەڵناو. سەربەس؛ سەربەخۆ ☰ مُستقل

⊡ **سەربەست کردن**: ١. تەرخان کردن؛ ڕێ بۆ کردنی هەموو کارێ پێ دان ٢. نرخی وا لە سەر ماڵی بۆ فرۆش دانان کە نەفرۆشێ ☰ ١. اختیارِ تام دادن ٢. نرخی بر کالا گذاشتن که به فروش نرسد

**سەربەست**[2]: ئاوەڵکار. سەربەس؛ ئازادانە ‹شیعری تۆ، گشت نموونە/ سەربەست ئەڕوا و خوڕەی دێ! «گۆران»› ☰ آزادانە

**سەربەستە**[1] / serbeste/: ئاوەڵناو. سەربەسە؛ نهێنی؛ پۆشراوی نەزانراو ‹موسوڵمانان! سوخەن سەربەستە تا کەی/ لە دەست ئەو کافری بێدینی تەرسا؟ «حاجی قادر»› ☰ سربسته

**سەربەستە**[2]: ئاوەڵکار. سەربەسە؛ بە نهێنی

‹سەربەستە پێت دەڵێم: خۆت لەو کارە مەدە!› ▣ سربسته

**سەربەستی** / serbestî/: ناو. سەربەسی؛ سەربەخۆیی ▣ استقلال

**سەربەسە** / serbese/: ☜ **سەربەستە**

**سەربەسەر**[1] / serbeser/: ناو. *[شوورەیی]* سەرووەسەر؛ گان بە گان ▣ مبادلەی دو همجنسباز

**سەربەسەر**[2]: ئاوەڵناو. سەرووەسەر؛ سەربەسەری: ١. بێ پێویستی بە پارە یان شتیتر ٢. وەک یەک؛ بەرامبەر ▣ ١. پایاپای (معامله) ٢. برابر

**سەربەسەر**[3]: ئاوەڵکار. سەرووەسەر: ١. یەکبەیەکی؛ سەربەسەری؛ بە شێوەی بەرانبەر ‹سەربەسەر بە زێڕم نەدەدا و ئێستا بە ئاردی دەفرۆشم! «هێمن»› ٢. بە گشتی؛ تەواوەتی ‹لە کن پشکووتنی غونچەی دەمی، وەک گوڵ، سەراسەر گوێم/ گوڵی ڕوخساری دەرخا، نێرگس‌ئاسا، سەربەسەر چاوم «مەحوی»› ٣. هەموو؛ تەواو ‹سەربەسەر میللەتی هەموو ژاپون/ زۆر بە زەحمەت دەگاتە چل ملیۆن «حاجی قادر»› ▣ ١. پایاپای ٢. یکسره ٣. همه

**سەربەسەرە** / serbesere/: ناو. *[شوورەیی]* سەرووەسەرە؛ سەرووەسەرێ؛ سەربەسەر؛ گان بە گان ▣ مبادلەی دو همجنسباز

**سەربەسەری** / serbeserî/: ☜ **سەربەسەر**[2]

**سەربەسی** / serbesî/: ☜ **سەربەستی**

**سەربەش** / serbeş/: ☜ **سەرپشك**

**سەربەشانە** / serbeşane/: ناو. سەرپشکانە؛ کاکەبەشانە؛ بەشی تایبەتی کە بە کەسێک دەدرێت ▣ امتیاز

**سەربەشایەتی** / serbeşayetî/: ناو. ☜ **ڕانت**

**سەربەشی** / serbeşî/: ناو. ئیمتیاز ▣ امتیاز

**سەربەقیتکە** / serbeqîtke/: ئاوەڵناو. پۆپنەکی؛ کاکۆڵدار ▣ کاکُلی

**سەربەکرێژ** / serbek(i)řêj/: ئاوەڵناو. ڕژەدار؛ قرێژ بە سەر ▣ شورەدار (سر)

**سەربەکڵاوە**[1] / serbek(i)ławe/: ناو. چورەپۆپنەکی ▣ چکاوک کاکُلی

**سەربەکڵاوە**[2]: ئاوەڵناو. ١. سەرپۆرت؛ کاکۆڵدار ‹کۆتری سەربەکڵاو› ٢. تایبەتمەندی بارانی دەنک درشت کە لە سەر گۆلاوە ئاو، بڵق دروست دەکا ▣ ١. کاکُلدار ٢. حُباب‌ساز (باران درشت)

**سەربەگۆبەن** / serbegoben/: ☜ **سەربەگۆبەند**

**سەربەگۆبەند** / serbegobend/: ئاوەڵناو. *[پلار]* سەربەگۆبەن؛ سەربەگێچەڵ؛ گێچەڵ‌بەقوون؛ گێچەڵ‌وەقنگ: ١. دنەدەری خەڵک ٢. هۆی ئازار و گرفتاری ▣ ١. تحریک‌کننده ٢. دردسرساز

**سەربەگێچەڵ** / serbegêçeł/: ☜ **سەربەگۆبەند**

**سەربەلک** / serbelik/: ناو. سەربەنگ؛ سەرتا؛ سەرگەڵا؛ سەر گەڵای تووتن ▣ نُخبەی برگ تنباکو

**سەربەمۆر** / serbemor/: ئاوەڵناو. سەرمۆر؛ نەکراوە؛ بە مۆری سەربەستە یان پاکەتەوە بۆ دڵنیایی لە هەڵنەتەکان و دەس تێ نەبران ‹خۆش لە سەر سینەی سەری هەڵداوە دوو گۆی سەربەمۆر / مات و حەیرانم کە عەرعەر کەی هەناری گرتووە! «نالی»› ▣ سربەمُهر

**سەربەن** / serben/: ناو. پەلکە؛ بەنی کەوش و پێڵاو ▣ بند کفش

⊡ **سەربەن گرێ دان:** کارێ (زیاتر بە قازانجی خۆ کردن) کردن ▣ کاری (بیشتر به سود خود) کردن

**سەربەند** / serbend/: ناو. ١. چەند وشەی سەرەتای گۆرانی ٢. وتەیێ لە گۆرانیدا کە پاش چەند شیعرێک دەگەڕێنەوە سەری ٣. بەستەی دوای مقام و لاوک ‹با بگێڕین زەماوەندێ/ با بۆتان بلێم سەربەندێ «سوارە»› ٤. سەردەستە؛ یەکمان؛ ڕێبەری دەستە ٥. قەپاخ؛ سەرپۆشی دەفری پچووک ٦. سەروێن؛ سەرپێچ ٧. لووتکە؛ ترۆپک

‹دامانی کێوەکانە لەسەد ڕەنگ ئاڵ و واڵ/ سەربەندی شاخەکانە، بە گوڵ نادیارییە «قانع»› ١. پیش‌درآمد ترانە ٢. ترجیع‌بند ترانە ٣. ترانەی بعد از مقام (آواز) ۴. سردستە ۵. سرپوش ظرف کوچک ۶. دستار ٧. قُلّە

**سەربەنگ / serbeng/:** ☜ **سەربەلك**

**سەربەها / serbeha/:** ناو. خوێنبایی؛ نرخی خوێنی کوژراو دیە؛ خونبها

**سەربەهەش / serbeheş/:** ئاوەڵناو. */کینایە/* گیرۆدە؛ تووشیار؛ هەڕگ وە سەر گرفتار

**سەربەهەوێ / serbehewê/:** ناو. ژنی هەویدار؛ ژنی پیاوی دوو ژنە زن هوودار

**سەربهورد / serbihurd/:** ناو. بەسەرهات؛ سەرگوروشتە سرگذشت

**سەربهوردە / serb(i)hurde/:** ☜ **سەربردە**

**سەربهوردی / serbihurdî/:** ناو. سەربردە؛ سەربهوردە؛ بەسەرهات سرگذشت

**سەربهورد / serb(i)hûrd/:** ☜ **سەربردە**

**سەربێر / serbêr/:** ناو. ١. کەسێ کە لە سەر بێر ئاژەڵ بۆ دۆشین دەگرێ ٢. یەکەم ئاژەڵ کە دێتە دۆشین لە بێردا ١. کسی کە حیوان را برای دوشیدن می‌گیرد ٢. اولین حیوانی کە دوشیدە می‌شود

**سەربێژنگ / serbêjing/:** ناو. سیفۆی نُخالە

**سەربێژنگە / serbêjinge/:** ئاوەڵناو. */کینایە/* دەستەوستان و بێدەسەڵات تنبل و ناتوان

**سەربێش / serbêş/:** ☜ **سەرپشك**

**سەربێن / serbên/:** ناو. ١. مێزەر ٢. دەرپۆش ١. دستار ٢. درپوش

**سەرپا / serpa/:** ئاوەڵناو. ڕاوێستاو؛ وێساو ایستادە

**سەرپاتە / serpate/:** ☜ **تلّفار**

**سەرپاچ / serpaç/:** ناو. کاری بژار دروون لە ناو چەڵتووک وجین در شالیزار

**سەرپاک / serpak/:** ئاوەڵکار. تێکرا؛ هەموو؛ گش ‹مزگەوتەکانت سەرپاک ڕووخاوە/ هەرچی پیاو تۆ بێ، چاک لێی قەوماوە «قانع»› تمامی

**سەرپاڵە / serpałe/:** ناو. بڕیاوان؛ پێشەنگی درەوکەران پیشرو دروگران

**سەرپان[1] / serpan/:** ناو. */باوەڕی کۆن/* جنۆکەی نۆکەری جادووگەر کە شتی بۆ دێنێ جن مُسخَّر جادوگر

**سەرپان[2]:** ئاوەڵناو. خاوەن سەری زل و پان سرگُندە

**سەرپایی[1] / serpayî/:** ناو. سەرپێیی: ١. دەمپایی؛ کەوشی سووکەڵەی بێ‌پانییە ٢. */کینایە/* زگەشۆرە؛ بەلەفیرە؛ زگڕەوانی ١. دمپایی ٢. اسهال

**سەرپایی[2]:** ئاوەڵناو. سەرپێیی؛ بە ڕاوەستانەوە ‹دەرمانی سەرپایی› سرپایی

**سەرپایی[3]:** ئاوەڵکار. */مەجاز/* سەرپێیی؛ بەلەز و پەلە و بێ ڕامان ‹سەرپایی چاوێکی لێ کرد› باعجلە

**سەرپرێس / serp(i)rês/:** ☜ **سەرپەرست**

**سەرپڕ / serpiř/:** ئاوەڵناو. ١. پڕ؛ گۆزان؛ دارماڵ؛ تژە؛ تژی؛ سەرڕێژ؛ لێوانلێو ٢. دەمپڕ؛ بە تایبەتمەندی پڕ بوون لە سەری لوولەوە ‹تفەنگی سەرپڕ› ١. لبریز ٢. سرپُر

**سەرپزوو / serpizû/:** ناو. پزوو؛ پزی؛ پزگ؛ جێگە دۆخین نیفە

**سەرپشک / serpişk/:** ئاوەڵناو. سەربەش؛ سەربێش: ١. تایبەتمەندی کەسێ کە پێش باقی بەشی خۆی هەڵگرێ ‹کاکم سەرپشک بوو، ئەسپی باشتری بۆ خۆی هەڵدەبژارد «هێمن»› ٢. سەربەست لە هەڵبژاردندا ‹خۆت سەرپشک بە! ئەخوێنی یان ئەچی بۆ کار؟› ١. دارای امتیاز انتخاب پیش از همە ٢. دارای اختیار در انتخاب

**سەرپشکانە / serpişkane/:** ☜ **سەربەشانە**

**سەرپشکایەتی / serpişkayetî/:** ☜ **ڕانت**

**سەرپشکی / serpişkî/:** ناو. تازیاری؛ هەڤیازی؛

دۆخی باشتر و لە پێشتر بوون ≡ امتیاز

**سەرپنج / serpinc**/: ناو. گیایەکە لە کەرتەشی دەچێ، بەڵام دڕکی نییە ≡ گیاهی است

**سەرپنۆم / serp(i)nom**/: ناو. گوێڕەپە؛ نەخۆشی بنانگوێ ئەستوور بوون ≡ بناگوشک؛ اُریون

**سەرپۆپە / serpope**/: ناو. سەرچڵەپۆپە؛ بان‌ترین شوێنی دار و درەخت ≡ فراز درخت

**سەرپۆت / serpot**/: ئاوەڵناو. سەرسەری؛ سەرچڵ؛ تەوڵباز؛ تەوەل؛ سەکەماتی؛ گەللایی؛ سەرەڕۆ؛ پەمڵەپڕی؛ تەتە؛ ترپڕ؛ هرت‌پرت؛ بەبێ سەرنج دان و شوێندا چوون ≡ سطحی؛ سرسری

**سەرپۆرت / serport**/: ☚ سەربەکڵاوە[2]ـ١

**سەرپۆش / serpoş**/: ناو. ١. سەرداپۆش؛ دەرخۆنە؛ ئامێرێک بۆ داپۆشین و سەرنانەوەی دەفر، کەلێن یان دەمی شتێک ٢. لەچک؛ هیشار؛ پارچەی سێ یان چوارسووچ، ژنان بە سەریدا دەدەن ≡ ١. سرپوش ٢. روسری

**سەرپەتی / serpetî**/: ئاوەڵناو. ١. سەرڕووت؛ سەرخواس؛ سەرکۆڵ؛ سەرقوت؛ تایبەتمەندی کەسێ کە هیچی بە سەرەوە نییە ٢. *[کینایە]* خاوەن ئاکاری پەسند، دوور لە بەرچاوتەنگی، خۆویستی و پێشداوەری ≡ ١. سربرهنه ٢. آزاده

**سەرپەردە / serperde**/: ناو. والان؛ کولەپەردەیەکی جوان کە بە سەر پەردەدا هەڵیدەواسن ≡ والان

**سەرپەرست / serperist**/: ناو. سەرپەرشت؛ سەرپرێس؛ سەرپەرستیار؛ سەرپەرشتیار؛ سەرپەرەست؛ سەرپەرەشت؛ ئەوی ئاگاداری دامەزراوە، ڕێکخراوە یان کەسێکی لە ئەستۆدایە و بەڕێوەی دەبات ≡ سرپرست

**سەرپەرستی / serperistî**/: ناو. سەرپەرشتی؛ سەرپەرستیاری؛ سەرپەرشتیاری: ١. ئاگاداری و چاوەدێری لە شوێن، کەس یان دامەزراوەیێ ٢. ماڵ یا ژوورێ کە سەرپەرستیاری تێدایە ≡ ١و٢. سرپرستی

**سەرپەرستیار / serperistyar**/: ☚ سەرپەرست

**سەرپەرستیاری / serperistyarî**/: ☚ سەرپەرستی

**سەرپەرشت / serperişt**/: ☚ سەرپەرست

**سەرپەرشتی / serperiştî**/: ☚ سەرپەرستی

**سەرپەرشتیار / serperiştyar**/: ☚ سەرپەرست

**سەرپەرشتیاری / serperiştyarî**/: ☚ سەرپەرستی

**سەرپەرەست / serperest**/: ☚ سەرپەرست

**سەرپەرەشت / serpereşt**/: ☚ سەرپەرست

**سەرپەڕ / serpeř**/: ناو. ١. ئەو پەڕ؛ ئەودیو؛ ئەولای شت ٢. یەکەم لاپەڕەی کتێب ٣. وێنەی سەر تۆپە قوماش ٤. *[مەجاز]* لای سەروو ‹ساقیا وا وەرگەڕێ! وا وەرگەڕێ!/ ڕوو لە لای من کە! مەچۆ بۆ سەرپەڕێ! «هێمن»› ٥. ئەو گایە دەکەوێتە سەری دەرەوە لە گێرەدا ‹گێرەشوێنێ کە نەیهێشت سووری ڕاستی قەت بدەین/ خۆی بنەی بێ‌کار و ئیشە، قەت خەتای سەرپەڕ نییە «قانع»› ≡ ١. ورا؛ آن سو ٢. اوّلین صفحه‌ی کتاب ٣. عکس یا مارک پارچه ٤. صدر مجلس ٥. گاو سمت خارج در خرمنکوبی

**سەرپەل[1] / serpel**/: ناو. ١. لقی بەرەژووری دار ٢. سەرکردەی سی هەتا پەنجا پێشمەرگە ٣. چاخی دەسپێکردنی بارانی پەڵە ≡ ١. شاخه‌های بالای درخت ٢. سردسته‌ی نظامی ٣. موسم باران

**سەرپەل[2]**: ☚ سەرسکڵی

**سەرپەلی / serpelî**/: ناو. سەرکردەیی پەل ≡ سردسته‌ای

**سەرپەڵە / serpeļe**/: ناو. ١. جەنگەی بارانی پاییز ٢. مانگی خەزەڵوەر ≡ ١. موسم باران پاییزی ٢. آبان ماه

**سەرپەنام / serpenam**/: ناو. سەرپەنم؛ ملەخڕێ؛ ملەخڕە ≡ اُریون

**سەرپەنجە / serpence**/: ناو. سەرئەنگوست: ١.

سەری پێنج ئەنگوست بە تێکڕایی ٢. ترت؛ گوفک؛ کومێ تللی؛ سەری تاکە ئەنگوستێک ✉ ١. سرپنجه ٢. سرانگشت

**سەرپەنم** / serpenim/: ☜ **سەرپەنام**

**سەرپەنە** / serpene/: ناو. قایمەمێو؛ داری ترێ کە دارەداڵووتی وە بەر دراوە ✉ تاک تنومند

**سەرپیرێژن** / serpîrêjin/: ناو. [پلار] بەربەرۆشک؛ تەمەڵی هیچلێنەهاتوو کە لە ماڵ دەرناچێ ✉ تنبلِ خانەنشین

**سەرپیل** / serpîl/: ناو. شان؛ سەرمل ✉ کتف

**سەرپێ** / serpê/: ئاوەلکار. پەلە؛ لەز ✉ شتاب

**سەرپێچ** / serpêç/: ناو. ١. مێزەر؛ شاشک ٢. سەری پێچدار کە گڵۆپی پێوە دەبەسترێ ✉ ١. عمامه ٢. سرپیچ لامپ

**سەرپێچی** / serpêçî/: ناو. سەربزێوی؛ نافەرمانی؛ کاری لادان لە فەرمان ✉ نسرپیچی

**سەرپێز** / serpêz/: ناو. جەژنی هەوەڵ حەیوان زان ✉ جشن زاییدن اولین گوسفند

**سەرپێشاو** / serpêşaw/: ناو. ئابخانە؛ دەساو؛ مەبال ✉ مُستراح

**سەرپێلک** / serpêlik/: ☜ **سەرەتا**

**سەرپێیی** / serpêyî/: ☜ **سەرپایی**

**سەرتا** / serta/: ناو. ١. میوەی هەرەباش کە دەیخەنە سەر سەبەتەوە ٢. ☜ **سەربەلک** ✉ ١. میوەی مرغوب که سرِ بار گذارند ٢. ☜ **سەربەلک**

**سەرتاپا** / sertapa/: ئاوەلکار. سەرتاپێ؛ هەموو لەش؛ گش ئەندام ‹درەخت تازەشین، سەرلق ڕازاوەی گوڵ، گەڵا، چرۆ/ سەرتاپای چیمەن دەر ئەدا چین ـ چین مرواری ئاونگ «گۆران»› ✉ سراپا

**سەرتاپێ** / sertapê/: ☜ **سەرتاپا**

**سەرتاس**[١] / sertas/: ناو. تاس؛ کەرەستەیەک بۆ هەلگرتنی کاڵای شفتە لە دوکان ✉ سرتاس

**سەرتاس**[٢]: ئاوەڵناو. سەربێموو؛ مووی سەر وەریو ✉ تاس

**سەرتاساو** / sertasaw/: ئاوەڵناو. کاس؛ گێژ؛ وڕ ✉ گیج و منگ

**سەرتاسەر** / sertaser/: ئاوەلکار. سەرانسەر؛ سەراسا؛ سەراسەر ‹سکووتێکی بە سام سەرتاسەری ئەم دێیە دادەگرێ/ دەڵێی هەر زیندەوارێکی هەیە لەو دێیەدا دەمرێ «هێمن»› ✉ سراسر

**سەرتاش** / sertaş/: ناو. سەرتراش: ١. دەلاک؛ مووبکار ٢. تیخی موو تاشین ✉ ١. سلمانی ٢. تیغ موتراش

**سەرتاشخانە** / sertaşxane/: ناو. دەلاکخانە؛ سەلمانی؛ ئارایشگا ✉ سلمانی

**سەرتاشراو** / sertaşraw/: ئاوەڵناو. سەرتاشیاگ؛ مووی سەر کورتکراوە ✉ سرتراشیده

**سەرتاشیاگ** / sertaşyag/: ☜ **سەرتاشراو**

**سەرتاق** / sertaq/: ناو. ١. دارەڕای سەر دەلاقە ٢. بەنی بادراو کە بۆ جەواڵدروون بە جەواڵییەوە هەڵدەواسن ✉ ١. چوبکهای تیر تاقچە ٢. نخ جوالدوزی که به جوال آویزند

**سەرتاک** / sertak/: ئاوەڵناو. سەرئاواڵە ✉ سرگُشاده

**سەرتاڵ** / sertał/: ناو. سەری هەودا دەزوو ✉ سرِ نخ

**سەرتراش** / sert(i)raş/: ☜ **سەرتاش**

**سەرترینج** / sertirînc/: ناو. شەترەنج؛ شاترنج ✉ شطرنج

**سەرتڤیرک** / sert(i)vîrik/: ئاوەڵناو. [پلار] سەرچکۆلە؛ سەرگچکە ✉ سرکوچک

**سەرتقلی** / sertiqlî/: ناو. دۆخی ڕەت بردن و بە سەرەوە کەوتن ✉ حالت سکندری خوردن و بر سر افتادن

**سەرتل** / sertil/: ناو. ١. کڵاوی قووچی دەروێشان ٢. کەپەنک؛ پاڵتۆی لباد ✉ ١. کُلاه بلند دراویش ٢. پالتوی نمدین

**سەرتلک** / sertilik/: ☜ **سەرتلیك**

**سەرتلی** / sert(i)lî/: ناو. قووچەکە؛ هەنگولیسکی دروومان ☰ انگشتانە

**سەرتلیک** / sert(i)lîk/: ناو. سەرتیلک؛ سەرتلک: ١. سەرتلک؛ بەتوو؛ ڕەحەتی ٢. قووچەکە؛ ئەنگوستیلەی دروومان ☰ ١. قیف ٢. انگشتانە

**سەرتڵ** / sertił/: ئاوەڵناو. ١. هەڵبژێراو؛ بژاردە؛ بەربژار ‹سەرتڵی جوانی› ٢. سەرگوڵ؛ هەرەباش؛ باشترین ☰ ١. برگُزیده ٢. بهترین

**سەرتوێ** / sert(i)wê/: ناو. سەرتوێژ؛ سەرتۆ؛ سەرشیر؛ سەرتوو؛ تۆژی؛ تۆژگ؛ توێژی؛ تۆژاڵی چەوری سەر شیر و ماست ☰ سرشیر

**سەرتوێژ** / sert(i)wêj/: ☜ **سەرتوێ**

**سەرتۆ** / serto/: ☜ **سەرتوێ**

**سەرتۆپ** / sertop/: ئاوەڵناو. یەکەم لە جوانی یان لە ئازایەتیدا ☰ اوّل در زیبایی یا شجاعت

**سەرتۆپز**[1] / sertopiz/: ناو. کەرکۆڵ ☰ گیاهی است

**سەرتۆپز**[2]: ئاوەڵناو. /پلار/ سەرزل؛ کەللە؛ کەلەزل ☰ کله‌گنده

**سەرتۆپە** / sertope/: ناو. قۆخ؛ ترۆپک؛ تۆپەسەر ☰ تارک

**سەرتو** / sertû/: ☜ **سەرتوێ**

**سەرتوتک** / sertûtik/: ناو. چینچک؛ تووتەکان؛ دانیشتن لە سەر هەر دوو پێ کە ئەژنۆ ڕێکی سنگ بێتەوە ☰ چُمباتمه

**سەرتووژ** / sertûj/: ☜ **سەرتیژ**

**سەرتول** / sertûl/: ناو. سەر لقی شلک و باریکی دارە مێو کە پێچ ـ پێچ و ترشە و دەخورێ ☰ شاخەی باریک و پیچان تاک

**سەرتەرز** / serterz/: ناو. تەرز؛ دەزووئاسای بەبرکەی بێستان و داری ڕەز ☰ نخ مانند انتهای تاک و بوتەی پالیزی

**سەرتەریدە** / serterîde/: ناو. سەرتەریە؛ گەورەی دەستەی ڕێگران ☰ رییس راهزنان

**سەرتەریە** / serterye/: ☜ **سەرتەریدە**

**سەرتەڕکە** / sterteřke/: ناو. پەڕۆیەکی تەڕە بە سەر گونکە هەویریدا دەدەن، کرێژ نەهێنێ و ڕەق نەبێتەوە ☰ پارچەی خیس روی چونەی نانوایی

**سەرتەزێن** / sertezên/: ئاوەڵناو. چیاگ؛ چایک؛ زۆر سارد ☰ تَگَری

**سەرتەشی** / serteşî/: ناو. کەرتەشی؛ سەرکەتەشی؛ گیایەکی سەرخڕی دڕکاوییە ☰ نوعی خار از خانوادەی خار تاتاری

**سەرتەقەکێش** / serteqekêş/: ناو. سەرپەلی تفەنگچییان ‹سەرتەقەکێشی نیشتمانپەروەری/ لاوی دلێری، کانی جەوهەری «قانع»› ☰ سردستەی تفنگداران

**سەرتەڵ** / serteł/: ئاوەڵناو. سەرنا؛ سەرتڵ؛ سەرچن؛ دەسچن (میوە و ...) ☰ دستچین (میوە و ...)

**سەرتەنگ** / serteng/: ناو. قایشێ کە بە سەر تەنگەی زیندا دێت ☰ نواری که بر تنگ زین آید

**سەرتەنور** / sertenûr/: ناو. دیوی نان کردن و چێشت لێنان ☰ مطبخ

**سەرتەونە** / sertewne/: ناو. دوو داری سەر و بنی دارتەون ☰ چوب‌های بالا و پایین دستگاه قالیبافی

**سەرتیپ** / sertîp/: ناو. گەورەی دەستەی سواران ☰ سرتیپ

**سەرتیر** / sertîr/: ناو. ١. سەرچیچک؛ سەرگۆی مەمک؛ چینچکی گوان ٢. ئاڵووداری درێژتر لە بان کە بێتە ئەنوا ☰ ١. نُک پستان ٢. الوارهای بلندتر از سقف

**سەرتیڕ** / sertîř/: ناو. سەرچیچک؛ سەرگۆی مەمک ☰ نُک پستان

**سەرتیژ** / sertîj/: ئاوەڵناو. سەرتووژ؛ سەرتێژ؛ نووکتیژ ☰ نُک‌تیز

**سەرتیک / sertîk/**: ناو. جەمسەری دروومان ☗ محل وصل پارچەی دوختە شدە

**سەرتیکە / sertîke/**: ☜ سەیدۆکە

**سەرتیل / sertîl/**: ناو. پەتێ کە دە سنگی چادر خراوە ☗ ریسمان رابط میخ و چادر

**سەرتیلک / sertîlik/**: ☜ سەرتلیك

**سەرتێژ / sertêj/**: ☜ سەرتیژ

**سەرتێشت / sertêşt/**: ناو. تاشت؛ نانی بەیانی ☗ چاشت

**سەرج / serc/**: ناو. جۆرێ پارچەی لە خوری، بۆ جلک ☗ نوعی فاستونی پشمی

**سەرجاخ / sercax/**: ناو. دەستەی تووتنی بە بەنەوە کراو ☗ دستەی تنباکو

**سەرجاڕ / sercař/**: ناو. سەرجال؛ کەوشەنی کێڵگە ☗ مرز بین مزارع

**سەرجازی / sercazî/**: ناو. پێخەسوو؛ پاخەسوو ☗ ینگە

**سەرجال / sercal/**: ☜ سەرجاڕ

**سەرجل / sercil/**: ناو. پەلاسێ کە بە سەر کۆپان و جلی بارەبەردا دەدرێ ☗ سرپوش پالان

**سەرجە / serce/**: ناو. نەخۆشییەکی ئەسپە ☗ از بیماری‌های اسب

**سەرجەلە / sercele/**: ناو. ١. هەوەڵ دانە لە ڕیز یان ڕزندا ٢. پێشەنگی مێگەل ☗ ١. اولی در صف یا ردیف ٢. پیشاهنگ گلە

**سەرجەم[١] / sercem/**: ئاوەڵناو. هەموو؛ گشت؛ سەرپاک ‹سەرجەم شارەکان؛ سەرجەم قوتابییەکان› ☗ همگی

**سەرجەم[٢]**: ئاوەڵکار. تێکڕا؛ تێگرایی ‹سەرجەم لیرەین؛ سەرجەم دەکاتە چەند؟› ☗ جمعاً

**سەرجەنجاڵ / sercencał/**: ئاوەڵناو. خەریک بە کار کە ناپەرژێتە سەر شتی‌تر. هەروەها: **سەرجەنجاڵی** ☗ سرگرم کار

**سەرجێیی / sercêyî/**: ناو. هاوسەرینی؛ کارێ پێکەوە نووستنی ژن و پیاو. هەروەها: **سەرجێی کردن** ☗ همخوابگی

**سەرچاخ / serçax/**: ناو. گوڵینگ و ڕیشووی سەری ژنان ☗ منگولە و رشتەهای سرپوش زنان

**سەرچادان / serçadan/**: ناو. پەڕۆیەکی گردی گولدۆزی کراوە، دەیدەن بە سەر قۆڕی چاییدا دەم بکێشێ ☗ پارچەی دمکش چای

**سەرچاو / serçaw/**: سارستە. بان چاو؛ بە سەر چاو: ١. بۆ بەخێر هێنان دەگوترێ، واتا پێتان/ پێلاوتان لە سەر چاوم ٢. بە چاوان؛ وا دەکەم ☗ ١. عبارتی برای خوشامد گویی ٢. به روی چَشم

**سەرچاوکە / serçawke/**: ☜ سەرچاوە

**سەرچاوگە / serçawge/**: ☜ سەرچاوە

**سەرچاوە / serçawe/**: ناو. سەرچاوکە؛ سەرچاوگە؛ سەرچەمە؛ سەروچاوە؛ سەروچاوێ؛ سەرینچاوە: ١. کانی؛ چاوەی ئاو ٢. کان؛ شوێنی سەر هەڵدان ‹سەرچاوکەی ڕەحمەت› ☗ ١. چشمە ٢. سرچشمە

**سەرچک / serçik/**: ناو. ترشەکشمیش؛ کشمیشە کەولی ☗ زرشک

**سەرچکۆلە / serç(i)kole/**: ئاوەڵناو. سەرتڤیرک؛ سەرگچکە ☗ سرکوچک

**سەرچڵ[١] / serçił/**: ناو. سەرچڵەپۆپ؛ سەرچڵەپۆپە؛ سەرەوەی لکەدار ‹کام سەرچڵ دڵت گرتی/ دەنگی لێ هەڵنەبڕی «گۆران»› ☗ شاخەی بالایی درخت

**سەرچڵ[٢]**: ئاوەڵناو. *[پلار]* سەرچڵەپۆپ؛ سەرچڵەپۆپە؛ سەرپۆت ‹کاری سەرچڵ› ☗ سرسری

**سەرچڵ[٣]**: ئاوەڵکار. ١. سەرسەری؛ بە هەڵە و پەلە و بێ تەکووزی ‹سەرچڵ کارێکی کرد و شپرز بەجێی هێشت› ٢. نیوەوناتەواو ‹بەلام هەرچۆنێک بێ سەرچڵ بۆت دەگێڕمەوە «هەژار، چێشتی مجێور»› ☗ ١. سرسری ٢. ناقص

**سەرچڵە پۆپ** / serç(i)łepop/: ☜ **سەرچڵ**[1]

**سەرچڵە پۆپە** / serç(i)łepope/: ☜ **سەرچڵ**[1]

**سەرچڵی** / serç(i)łî/: ناو. دۆخی سەرسەری بوون؛ بێ سەرنج دان و تێڕامان ☰ حالت سطحی و سرسری بودن

⊡ **بە سەرچڵی**: بەبێ وردبوونەوە و تێڕامان ☰ سرسری

**سەرچمک** / serçimk/: ئاوەڵناو. شاکەڵ؛ گەشترین گیای بەهار ☰ شاداب‌ترین سبزەی بهاری

**سەرچن**[1] / serçin/: ناو. کاری ڕنینی پەلکی سەرەوەی چای و تووتن و ڕێحانە و ... ☰ عمل چیدن برگ‌های بالایی

**سەرچن**[2]: ☜ **سەرتەڵ**

**سەرچنگانە** / serçingane/: ناو. کاری لە سەر دەست و پێ ڕۆیشتن ☰ چارچنگولی

**سەرچومەت** / serçumet/: ☜ **سۆتك**

**سەرچۆپی** / serçopî/: ناو. ١. ئەو کەسەی لە سەرەتای بازنەی هەڵپەڕکێدایە ٢. دەسرە و دەسماڵی دەستی ئەوەی لە سەرەتای بازنەی هەڵپەڕکێوە هەڵدەپەڕێ ‹سەرچۆپی بدەی بە گامێشێ، بەرەو کادێنی دەکێشێ! «مەسەل»› ٣. ☜ **سەرچۆپی‌کێش** ☰ ١. جایگاه پیشاهنگ حلقەی رقص ٢. دستمال دست پیشاهنگ حلقەی رقص ٣. ☜ **سەرچۆپی‌کێش**

**سەرچۆپی‌کێش** / serçopîkêş/: ناو. سەرچۆپی؛ ڕەمکێشی هەڵپەڕکێ ‹نە سەرچۆپی‌کێش نە دوایی‌گیرم/ لە بەر بارکێشان مات و زویرم «قانع»› ☰ پیشاهنگ رقص گروهی

**سەرچۆپیگر** / serçopîgir/: ناو. سەردەلیل؛ سەردیلان ☰ سرگروه رقص

**سەرچۆک** / serçok/: ناو. ١. زرانی؛ کەشکەئەژنۆ ٢. *[کینایە]* کڕنووش؛ کوڕنوو ☰ ١. کشکک زانو ٢. کُرنش

**سەرچە** / serçe/: ناو. چێشکە؛ چویک؛ چۆلەکە؛ پاساری ☰ گُنجشک

**سەرچەم** / serçem/: ناو. دەمچۆم؛ بەستێن ☰ کنارەی رودخانە

**سەرچەمە** / serçeme/: ☜ **سەرچاوە**

**سەرچەوت** / serçewt/: ئاوەڵناو. *[پلار]* ١. فێڵباز؛ ناحەساو؛ حیساب‌ناڕاست ٢. گوێ‌نەبیس؛ بێ‌گوێچکە ☰ ١. بدحساب ٢. حرف‌نشنو

**سەرچەوتی** / serçewtî/: ناو. سەربزێوی؛ نافەرمانی ☰ نافرمانی

**سەرچیت** / serçît/: ناو. ئێکەم شەوی چوونە زۆزان ☰ اولین شب ییلاق

**سەرچیچک** / serçîçik/: ناو. سەرتیڕ؛ سەرگۆی مەمک ☰ نُک پستان

**سەرحاڵ** / serĥał/: ئاوەڵناو. باحاڵ؛ سەرکەیف ☰ سرزندە

**سەرحاڵی** / serĥałî/: ناو. کۆکی؛ دەماخ‌چاخی ☰ تردماغی

**سەرحامیلە** / serĥamîle/: ئاوەڵناو. پاوەمانگ؛ نۆمانگ؛ تایبەتمەندی ژنی دووگیان لە مانگی ئاخری دووگیانیدا ☰ پابەماە

**سەرحەد** / serĥed/: ناو. سنوور؛ کەوشەن؛ مەرز ☰ مرز

**سەرحەساو** / serĥesaw/: ئاوەڵناو. ئاگادار؛ خەبەردار ☰ باخبر

⊡ **سەرحەساو کردن**: ١. ئاگادار کردن ٢. بانگ/ قاو/ دەنگ کردن ☰ ١. خبردار کردن ٢. دعوت کردن

**سەرخان** / serxan/: ناو. باڵەخانە؛ ژوور لە نهۆمی سەرەوە ☰ بالاخانە

**سەرخلۆل** / serx(i)lol/: ئاوەڵناو. *[پلار]* دەبەنگ؛ بێ‌مێشک ☰ تُهی‌مغز

**سەرخوار** / serx(i)war/: ئاوەڵناو. ملکەچ؛

گوێڕایەڵ؛ بەرفەرمان ☰ فرمانبُردار

**سەرخواس / serx(i)was/:** ئاوەڵناو. سەرپەتی؛ سەرڕووت؛ تایبەتمەندی کەسێ کە هیچی لە سەر نەبەستووە ☰ سربرهنه

**سەرخولێ / serxulê/:** ناو. گێژی؛ سەرەگێجە ☰ گیجی

**سەرخوێن / serx(i)wên/:** ☜ سوورِی مانگانە

**سەرخۆ / serxo/:** ئاوەڵناو. ١. سەربەخۆ؛ سەربەست ٢. لەسەرخۆ؛ هێدی؛ ئارام ☰ ١. مُستقل ٢. آرام

◘ **سەرخۆ بوون:** سەربەست بوون؛ سەربەخۆ بوون ☰ مُستقل بودن/ شدن

**سەرخۆر[1] / serxor/:** ناو. دەرد و بەڵای ئاسمانی ☰ بلای آسمانی

**سەرخۆر[2]:** ئاوەڵناو. *[مەجاز]* شووم و بێفەر ☰ بدشگون

**سەرخۆش[1] / serxoş/:** ئاوەڵناو. مەست ‹نالی کە قەدەحنۆشە، مەستانە و سەرخۆشە/ خامۆش و نمەدپۆشە، ئەشعاری لە کن پەشمە «نالی»› ☰ مست

**سەرخۆش[2]:** سارستە. وشەی جوابی دەس خۆش ☰ سرِ شما درد نکند

**سەرخۆشی / serxoşî/:** ناو. ١. مەستی؛ دڵشادی بادە خواردنەوە ٢. پرسە؛ سەرەخۆشی ☰ ١. مستی ٢. ترحیم

◘ **سەرخۆشی کردن:** دڵنوایی کردن لە خاوەن مردوو ☰ تسیلت گفتن

**سەرخوونک / serxûnik/:** ناو. بولبول؛ بلبل ☰ بُلبُل

**سەرخەت / serxet/:** ناو. سنوور؛ کەوشەن؛ مەرز ☰ مرز

**سەرخەر / serxer/:** ئاوەڵناو. لاسار؛ گوێنەبیس ☰ لجباز

**سەرخەو / serxew/:** ناو. سووکەلەخەو؛ بیرەخەو ☰ چُرت

◘ **سەرخەو شکاندن:** سەرخەو کردن؛ وەنەوز دان ☰ چُرت دادن

**سەرخەو کردن:** ☜ سەرخەو شکاندن

**سەرخێڵ / serxêł/:** ناو. سەرعێل؛ سەرداری عێل؛ سالاری هۆزی کۆچەر ☰ ایلخان

**سەرد / serd/:** ☜ سارد

◘ **سەردۆ کردن:** ☜ سارد کردنەوە

**سەردەو بون:** ☜ سارد بونەوە

**سەردەو کردن:** ☜ سارد کردنەوە

**سەردا / serda/:** ئامراز. لە بالاوە؛ لە بلندەوە ☰ از بالا

**سەرداپۆش / serdapoş/:** ☜ سەرپۆش

**سەردار[1] / serdar/:** ناو. ١. سالار ٢. جۆرێ گەنم ☰ ١. سردار ٢. نوعی گندم

◙ **سەرداری عێل:** ☜ سەرخێڵ

**سەردار[2]:** ئاوەڵناو. بە سەر ‹قازانی سەردار› ☰ سرپوش‌دار

**سەرداری / serdarî/:** ناو. ١. سالاری؛ سەرۆکایەتی ٢. جۆرێ بالاپۆش ٣. نوقلەکوردی؛ برێشکەی گەنمەشامی ☰ ١. سرداری ٢. لباس سرداری ٣. ذرّت بوداده

**سەرداڤ / serdav/:** ☜ سارداوە

**سەرداگوم / serdagum/:** ☜ سەرگوم

**سەردان / serdan/:** ناو. سەرەناز؛ سەرناز ☰ سرانداز

**سەرداندن / serdandin/:** چاوگ. شەرداندن؛ وێڵ و وەیلان کردن ☰ آوارە کردن

**سەرداو / serdaw/:** ☜ سارداوە

**سەرداوکە / serdawke/:** ☜ سەرکان ـ٢

**سەرداوە / serdawe/:** ☜ سارداوە

**سەردخانە / serdxane/:** ☜ ساردخانە

**سەردڕ[1] / serdiř/:** ناو. ١. بەرگر؛ جلکێ کە لە سەرەوە دە بەر دەکرێ بۆ پاراستنی جلکی باشتری بنەوە ٢. بەرگی نوێ و تازەدووراو ☰ ١.

ڕوپوش ٢. لباس نودوختە

**سەردڕ**[٢]: ئاوەڵناو. تەنراوە؛ جۆلایی‌کراو ☰ منسوج

**سەردڕانە** / serd(i)řane/: ناو. دەسخۆشانە و پاداشی شاگردی جلدروو ☰ انعام شاگرد خیاط

**سەردڵ** / serdił/: ناو. /مەجاز/ گرفت؛ جۆرێ نەخۆشییە ☰ نوعی بیماری

**سەردوا** / serdwa/: ناو. سەردەوا؛ پایز؛ پاییز؛ چرِی؛ سێهەم کژ لە چوار وەرزی ساڵ ☰ فصل پاییز

**سەردوگەرم** / serd û germ/: ☜ **ساردوگەرم**

**سەردولکان** / serdulkan/: ☜ **سەردولکە**

**سەردولکە** / serdulke/: ناو. سەردولکان؛ چەمەری؛ نۆحە؛ سەروە؛ شیعر یان بەستەیەکی شیوەناوی کە لە پرسەدا بە ئاوازەوە دەیخوێنن ☰ نوحە

**سەردولکەبێژ** / serdulkebêj/: ناو. نەهاری؛ بلاو؛ مردوولاوێن ☰ نوحەخوان

**سەردۆشەک** / serdoşek/: ناو. پارچەیێ کە بە سەر دۆشەکیدا هەڵدەکێشن ☰ روتُشکی

**سەردۆڵ** / serdoł/: ناو. جێگەی ڕژانی ئاوی ئاسیاو لە دۆڵاشدا ☰ جای ریزش آب در ناو آسیا

**سەردۆڵە** / serdołe/: ناو. سفرەی چەرمی نانکەر ☰ سُفرەی چرمین نانوایی

**سەردووک** / serdûk/: ناو. پەیژە؛ پەیجە؛ پەینجە ☰ نردبام

**سەردەرانە** / serderane/: ناو. سەردەری: ١. داری سەرووی چوارچێوەی دەرگا ٢. هەڵچندراوی سەر دەرگا ☰ ١. آستانە ٢. بالای در

**سەردەرچوو** / serderçû/: ئاوەڵناو. سەردەرچووگ؛ لێزان ☰ وارد

**سەردەرچووگ** / serderçûg/: ☜ **سەردەرچوو**

**سەردەری** / serderî/: ☜ **سەردەرانە**

**سەردەس** / serdes/: ☜ **سەردەست**

**سەردەست** / serdest/: ناو. سەردەس؛ قۆڵ؛ دەربال؛ ئاسین؛ سۆرانی؛ بەشێ لە جلوبەرگ کە لە شانەوە تا سەری دەست دادەپۆشێ ☰ آستین

**سەردەستان** / serdestan/: ئاوەڵناو. لە حاڵی زاندا ☰ در حال زایمان

**سەردەستە** / serdeste/: ئاوەڵناو. سەردەسە: ١. سەرۆکی کۆمەڵ ‹گاجووت ئەکەیتە سەردەستەی ئەعیان!/ ئەدەیتە ڕێوی نەعرەتەی شێران! «قانع»› ٢. /کینایە/ بژاردە؛ هەڵبژاردە ☰ ١. رییس گروە ٢. برگُزیدە

**سەردەستەکی** / serdestekî/: ئاوەڵکار. بە پێوە؛ بە سەر پاوە ‹سەردەستەکی تفەنگی هاویشت› ☰ ایستادە

**سەردەسە** / serdese/: ☜ **سەردەستە**

**سەردەسێر**[١] / serdesêr/: ناو. ساردەسێر؛ کێوسان؛ کوێستان؛ کۆسال؛ زۆزان؛ ئێلاخ؛ ناوچەی بە هاوینان فێنک و بە زستانان شەختە ☰ سردسیر

**سەردەسێر**[٢]: ئاوەڵناو. ساردەسێر؛ زۆزان؛ تایبەتمەندی شوێنێ کە دەمای کەمتر لە ٢٠ پلەکی سلسیووس بێ ☰ سردسیر

**سەردەفتەر**[١] / serdefter/: ناو. کەسێ کە لە دەزگای دەوڵەت بە سەر نووسەران ڕادەگا ☰ سردفتر

**سەردەفتەر**[٢]: ئاوەڵناو. بژاردە؛ هەڵبژاردە ☰ گزیدە

**سەردەڤک** / serdevik/: ناو. سەرپۆشی دەفر ☰ سرپوش ظرف

**سەردەق** / serdeq/: ئاوەڵناو. ١. نەژاکاو؛ دانەچەکاو ٢. دەژ؛ دەس‌لێنەدراو ☰ ١. شاداب ٢. بِکر؛ دستنخوردە

▣ **سەردەق شکاندن**: /کینایە/ دەسپێشخەری کردن؛ بەر لە خەڵک دەست بۆ کارێ بردن ☰ پیشدستی کردن

**سەردەلیل** / serdelîl/: ناو. سەردیلان؛ سەرچۆپی ☰ سرگروە رقص

**سەردەم**[١] / serdem/: ناو. ١. کات؛ وەخت؛ دەورە؛

چاخ؛ چەرخ ‹گەلێکم ڕۆژگاری تاڵ و شیرین ڕابوارد ئاخۆ/ مەرگ مەودا دەدا دیسان ببینم سەردەمێکی‌تر «هێمن»› ٢. بەشی سەرووی ئالـف و کـا و هـەر شـتێ کـە لـە ڕەشـکە یـان دەفـری بارکێشـان دەئـاخنرێ ٣. گـەڵا و هـەر شـتێ کـە سـەری ڕەشکەی پـێ دادەپۆشـن ☰ ١. عصـر؛ روزگـار ٢. سطح خارجی علوفه در تور کاهکشی ٣. سرپوش تـور کاهکشی

**سەردەم**[٢]: ئاوەڵناو. هاوچەرخ؛ هاوکات؛ هاوڕۆژگار ☰ هم‌عصر؛ مُعاصر

**سەردەمە / serdeme/**: نـاو. دەمپۆشـی سـاوا لـە بێشکەدا ☰ دهن پوش نوزاد در گهواره

**سەردەمی / serdemî/**: ئاوەڵناو. ١. کـاتی؛ وەخـتی؛ نـە هەمیشـەیی ٢. هاوچـەرخی؛ سـەر بـە ئـەم ڕۆژگارە ☰ ١. موقتی ٢. هم‌عصری

**سەردەمێ / serdemê/**: ☜ سەردەمێك

**سەردەمێک / serdemêk/**: ئاوەڵکار.سـەردەمێ؛ لـە ڕۆژگارێکا ‹سـەردەمێک ئـاوارە بـووم و مـاوەیێکیش دەسبەسەر/ نەمدی ڕووی ئاسوودەیی، هـەر تووشـی گێرە و قەڕقەشم «هێمن»› ☰ یک وقتی

**سەردەن / serden/**: نـاو. دەرخۆنـەی کووپـە ☰ نُهنبان خم

**سەردەنشت / serdenişt/**: ☜ سەرزەنش

**سەردەوا / serdewa/**: ناو. ☜ سەردوا

**سەردەوچ / serdewiç/**: ئاوەڵـناو. سـەرمایی؛ سارۆکی (پیاو) ☰ سرمایی (مرد)

**سەردەوچە / serdewiçe/**: ئاوەڵـناو. سـەرمایی؛ سارۆکی (ژن) ☰ سرمایی (زن)

**سەردی / serdî/**: ☜ ساردی

**سەردیقانێ / serdîqanê/**: ☜ سەرەتاتکێ

**سەردیلان / serdîlan/**: نـاو. سەردەلیل؛ سـەرچۆپی ☰ پیشاهنگ رقص کردی

**سەردێر / serdêr/**: نـاو. ئاودانێکی کەم بۆ گەنم لـە پاییزدا ☰ آبیاری مُختصر گندم در فصل پاییز

**سەردێڕ / serdêř/**: نـاو. ١. پێناسـە؛ سـەرتۆپ؛ ئەوەی بۆ ناساندنی کەسێ یان جێگایەک بە کـار دێ (وەک: کوردسـتان، سـەرۆک‌کۆمـار، شـارەوانی و...) ٢. نووسراوەیەک لە سەر ڕۆژنامە، گۆڤار یان پەرتووکێ کـە پێناسـەکانی (وەک: نـاو، نووسـەر، مێژوو، بلاڤۆک و...) پیشان دەدا ‹سەردێڕی کتێب› ٣. دێڕێ لە سەرووی گوتار یـان نووسـراوەیەکدا کە دەربڕی چەمک یان مەبەستەکەیە ‹سەردێڕی گوتار› ٤. ناو؛ وشە یان دێڕێ کە نیشاندەری پلە، جێگە یان کاری کەسێکە (وەک: نژیارڤـان، شـێخ، سەرۆک، دوکتور و ...) ☰ ١تا۴. عنوان

**سەرڕا / serřa/**: ئـامراز. ١. سـەرلەنوێ؛ ژ نـوو؛ هەمیسان ٢. لە ژوورەوە؛ لە بانەو ☰ ١. از نـو ٢. از بالا

**سەرڕاس / serřas/**: ☜ سەرڕاست

**سەرڕاست / serřast/**: ئاوەڵناو. سـەرڕاس: ١. ڕێـک؛ ڕاستەوڕاست ٢. دەسپاک؛ بێ‌خـواری و لاری ٣. کارامە و لێزان ٤. ڕێک؛ ڕۆند؛ تایبەتمەندی ژمارە یا حیسابێ کە وردە ژمارەی نەبێ ☰ ١. مُستقیم ٢. امین ٣. ماهر ۴. روند

**سەرڕاستی / serřastî/**: ناو. دەسـپاکی؛ بـێ‌گـزی و دزی ☰ دُرُستکاری

**سەرڕای / serřay/**: ☜ سەرەڕای

**سەرڕشتە / serřişte/**: نـاو. سەرڕوشـتە: ١. سـەرتا؛ سەرتاڵ ٢. لێزانی لە کار ☰ ١. سرنخ ٢. مهارت در کار

**سەرڕوشتە / serřuşte/**: ☜ سەرڕشتە

**سەرڕووت / serřût/**: ناو. ١. کەسێ هیچی لە سـەر نەبەستبێ ٢. [کینایە] خوێندەواری زانسـتگا ☰ ١. سربرهنه ٢. تحصیلکردەی دانشگاه

**سەرڕەش**[١] **/ serřeş/**: ناو. سەرڕەشە: ١. [مەجاز] ژن ٢. مـەلێکی پچووکـە سـەری ڕەشـە ☰ ١. زن ٢.

پرندەای است

**سەرڕەش**[٢]: ناوەڵناو.[پەلار] قۆشمە؛ تایبەتمەندی کەسێ کە دایمە بەراوەردی خراپ دەکا ☰ سیق سیاه

**سەرڕەشە** / serřeşe/: ناو. ١. ☜ سەرڕەش[١] ٢. گیایەکی گەلاباریکە، لە پوار دەچێ ☰ ١. ☜ سەرڕەش[١] ٢. گیاهی است

**سەرڕەق** / serřeq/: ناوەڵناو.[پەلار] سەرقورس؛ سەرسەخت؛ چەق ☰ سرسخت

**سەرڕەقی** / serřeqî/: ناو.[پەلار] سەرقورسی؛ سەرسەختی؛ لاساری ☰ سرسختی

**سەرڕەو**[١] / serřew/: ناو. پڕتاو؛ غاری توند ☰ دو سریع

**سەرڕەو**[٢]: ناوەڵکار. بە سەرەو؛ دۆخی ڕەت بردنی دوای هەڵەنگووتن، کە سەر لە پێشە و لاق بە توندی هەڵدێتەوە ☰ تلوتلو

**سەرڕێداچوو** / serřêdaçû/: ناوەڵناو. لەڕێلاداو؛ ڕێگوم‌کردوو ☰ گُمراه

**سەرڕێز** / serřêz/: ☜ سەرڕێژ

**سەرڕێژ** / serřêj/: ناوەڵناو. سەرڕێز؛ لیپ؛ لێوانلێو ☰ لبریز

⊡ **سەرڕێژ بوون** لێ ڕژان لە بەر پڕی دەفر ☰ لبریز شدن

**سەرڕێژنە** / serřêjne/: ☜ سەلیقە

**سەرڕێگر** / serřêgir/: ناو. چەتە؛ ڕێگر ☰ راهزن

**سەرزارەکی** / serzarekî/: ناوەڵناو. سەرزاری: ١. زارەکی؛ زمانی؛ زوانی ٢. هەر قسە و بێ کردەوە ☰ ١. شفاهی ٢. زبانی (بی‌عمل)

**سەرزاری** / serzarî/: ☜ سەرزارەکی

**سەرزڤرین** / serzivrîn/: ناوەڵناو. سەمەرە؛ مایەی سەرسووڕمان ☰ مایەی تعجب

**سەرزگە** / serz(i)ge/: ناو. چۆنیەتی لەرزینی زۆر بە تەوژم لە ترسان ☰ لرز شدید از ترس

**سەرزل** / serzil/: ناوەڵناو.[پەلار] سەرزەلام؛ کەللە؛ کەلەزل؛ سەرگەورە ☰ سرگُنده

**سەرزەدە**[١] / serzede/: ناو. پاژی پچووک لە خشت ☰ قطعەای از آجر

**سەرزەدە**[٢]: ناوەڵناو/ ناوەڵکار. بێ‌پرس و ڕا؛ کوت‌وپڕ؛ بێ‌خەبەر ☰ سرزدە

**سەرزەلام** / serzelam/: ☜ سەرزل

**سەرزەمین** / serzemîn/: ☜ سەرزەوی

**سەرزەنش** / serzeniş/: ناو. سەردەنشت؛ سەرزەنشت؛ سەرکۆمە؛ لۆمە ‹سەر بۆ سەربڕین، نەک بۆ سەرزەنش› ☰ سرزنش

**سەرزەنشت** / serzenişt/: ☜ سەرزەنش

**سەرزەوی** / serzewî/: ناو. سەرزەمین: ١. ڕووبەری زەوی ٢. ناوچە؛ مەڵبەند ☰ ١. سرزمین ٢. منطقە

**سەرزەیە** / serzeye/: ناوەڵناو. سەربزێو ☰ گردنکش

**سەرزین** / serzîn/: ناو. زین‌پۆش ☰ سر زین

**سەرزیوارە** / serzîware/: ناو. سەر ئێوارە؛ هەرەتگای تەنگ ☰ عصر هنگام

**سەرژان** / serjan/: ناو. بەرەژان؛ یەکەم ژانی بێچوو بوون ☰ آغاز درد زایمان

**سەرژمار** / serj(i)mar/: ☜ سەرژمێر

**سەرژماری** / serj(i)marî/: ☜ سەرژمێری

**سەرژمێر** / serj(i)mêr/: ناو. سەرئەژمێر؛ سەرژمار: ١. کاری سەرژماری کردن ٢. کەسێ کە کاری سەرژمێرییە ☰ ١. آمار ٢. آمارگیر

**سەرژمێری** / serj(i)mêrî/: ناو. سەرئەژمێری؛ سەرژماری؛ سەرنفیسی؛ هەڵژماری؛ کاری بژاردنی کەسانی نێو کۆمەڵگا ☰ سرشُماری

**سەرژنانە** / serj(i)nane/: ☜ سەرژنانیلە

**سەرژنانیلە** / serj(i)nanîle/: ناوەڵناو.[پەلار] سەرژنانە؛ ژنانیلە؛ بلەکناچێ؛ ئاغەباجی؛ ژنەڕەنگە؛ قالەژنە ☰ زن‌نما

**سەرژنک** / serjink/: ☜ سەرژنکانی

**سەرژنکانی / serjinkanî/:** ئاوەڵناو. *[پلار]* سەرژنک؛ ئـەنگوتکبڕێـر؛ تایبەتمەنـدی پیـاوێ کـە لـە ماڵـەخۆیدا چـرووک و ڕژدە 🇮🇷 خُشـکدسـت بـا خانوادە

**سەرژێ / serjê/:** ↓

▣ **سەرژێ کرن:** سەر بڕین 🇮🇷 ذبح کردن

**سەرژێکەر / serjêker/:** ناو. قەساب؛ گوڕێن 🇮🇷 سلّاخ

**سەرساخ / sersax/:** ئاوەڵناو. ساق؛ بێوەی 🇮🇷 سالم

**سەرساخی / sersaxî/:** ☜ **سەرساغی**

**سەرسارد / sersard/:** ئاوەڵناو. *[مەجاز]* کەمتەرخـەم ‹لـە هەمبـەر ئـەم گرفتـەوە سەرسـارد و بـێخـەم نەبووین› 🇮🇷 بیمُبالات

**سەرساغی / sersağî/:** نـاو. سەرسـاخی؛ سـاغی؛ سلامەت 🇮🇷 سلامت

**سەرساڵ / sersał/:** ناو. نەورۆز؛ جـەژنی سـەرەتای خاکەلێوە 🇮🇷 نوروز

**سەرسام[1] / sersam/:** ناو. نەخۆشی تێکچوونی باری ئاسـایی ڕەوانی. هــەروەها: **سەرسـام گـرتن** 🇮🇷 سرسام

**سەرسـام[2]:** ئاوەڵـناو. سـەرەمەند؛ حەپەسـاو؛ سەرسووڕماو؛ واقوڕماو ‹سەرسامەن عالەم یەکسەر جـە ناڵـەم/ فەلـەک مـۆرەی بـەد شـانا وە تاڵـەم «مەولەوی»›. هەروەها: **سەرسام بـوون** 🇮🇷 مـات و مُتحیر

**سەرسامکەر / sersamker/:** ئاوەڵـناو. گێژکـەر؛ سەرسووڕێنەر 🇮🇷 گیج‌کننده

**سەرسامە / sersame/:** ناو. نیشانەی عەجایب مـان لە نووسیندا، کـە بـەم شـێوەیە: «!» 🇮🇷 علامـت تعجُب

**سەرسب / sersib/:** ☜ **سەرسبە**

**سەرسبە / sers(i)be/:** نـاو. سەرسـب؛ سەرسـۆح؛ بەری بەیانی 🇮🇷 کلّەی سحر

**سەرسپی / sers(i)pî/:** نـاو. *[مەجاز]* پـۆپچـەرمگ؛ ژنی پیری بەڕێز و تەگبیر لە ئاواییدا 🇮🇷 گیسوسفید کدخدامنش

**سەرسڤک / sersivik/:** ☜ **سەرسوک**

**سەرسڤکی / sersiv(i)kî/:** ☜ **سەرسوکی**

**سەرسکلی / sersikłî/:** ئاوەڵناو. سـەرپەل؛ لـە سـەر پەنگرەوە برژاو 🇮🇷 برشته بر اخگر

**سەرسلامەتی / sers(i)łametî/:** ☜ **سەرەخۆشی-۱**

**سەرسم / sersim/:** ناو. ڕەتی یەکسـم 🇮🇷 سـکندری (چهارپا)

▣ **سەرسم بردن:** ☜ **سەرسم دان**

**سەرسم دان:** سەرسم بـردن؛ ڕەت دانی یەکسـم 🇮🇷 سکندری رفتن چهارپا

**سەرسم کرن:** سم تاشین 🇮🇷 سُم تراشیدن

**سەرسنگ / sersing/:** ☜ **سەرسینگ**

**سەرسواڵک / sers(i)wałik/:** نـاو. ڕیخۆڵە گەورە 🇮🇷 رودەی بزرگ

**سەرسـواڵکەر / sers(i)wałker/:** ئاوەڵـناو. *[پـلار]* سرِسواڵکەر؛ سەرسواڵکەرە؛ خازۆک؛ خوازەڵـۆک؛ لیفۆک 🇮🇷 گدامنش

**سـەرسـواڵکەرە / sers(i)wałkere/:** ☜ **سەرسواڵکەر**

**سەرسوانە / sers(i)wane/:** نـاو. پاسـارە؛ سـوانە 🇮🇷 لبەی بام

**سەرسۆت / sersot/:** ☜ **سۆتك**

**سەرسۆح / sersoĥ/:** ☜ **سەرسبە**

**سەرسۆدەرە / sersodere/:** ☜ **سەرەسۆدرە**

**سەرسۆر / sersor/:** ئاوەڵـناو. بێدایک و سەرپەرست 🇮🇷 یتیم بی سرپرست

**سەرسۆرک / sersorik/:** ناو. چێشتێکی کوردەوارییە 🇮🇷 نوعی غذای کُردی

**سەرسـۆفیلکە / sersofîlke/:** نـاو. گیایەکـە وەک تاڵوو وایە، گوڵێکی تووکنی سـپی خـڕ دەکـا 🇮🇷 گیاهی است

**سەرسۆنگە** / sersonge/: ناو. ئارخەیانی ‹کاری وا وە سەرسۆنگە دەکرێ› 🇮🇷 فراغت

**سەرسوور**[١] / sersûr/: ناو. ١. جۆرێک مراوی سەر و مل سووری لەش قاوەیی، سینگ ڕەش، دندووک شینی کاڵ و سەری دندووک ڕەشە، زۆرتر لە ئاوی قووڵدا دەژی و کەمتر دیتە وشکایی ٢. *[کینایە]* ئەندامی زاوزێ پیاو 🇮🇷 ١. اُردک سرخنایی ٢. آلت مرد

**سەرسوور**[٢]: ئاوەڵناو. ١. بە سەروقژی سوورەوە ٢. *[کینایە]* وەشارتوو؛ نهێنی 🇮🇷 ١. با سر و موی سُرخ ٢. پنهان

▣ **سەرسووری بنەدڕاو**: سەرسووری بندڕیای؛ سەرسووری بنشڕ؛ لە دوور جوانی لە نزیک ناحەز 🇮🇷 گندم‌نمای جوفروش

**سەرسووری بندڕیای**: ☜ **سەرسووری بندڕاو**

**سەرسووری بنشڕ**: ☜ **سەرسووری بندڕاو**

**سەرسووری بەحری**: جۆرێک مراوی کێوییە، سەری سوور و کلاونەیە 🇮🇷 اُردک تاجدار

**سەرسووڕ** / sersûř/: ئاوەڵناو. سەرسام؛ مات 🇮🇷 مات و مُتحیر

**سەرسووڕماو** / sersûřmaw/: ئاوەڵناو. سەرسام؛ حەپەساو؛ واقوڕماو 🇮🇷 مات و متحیر

**سەرسووڕماوی** / sersûřmawî/: ناو. سەرسامی؛ ماتی 🇮🇷 تحیُّر

**سەرسووڕێن** / sersûřên/: ئاوەڵناو. سەرزڤڕێن؛ سەیر و سەمەرە 🇮🇷 شگفت‌انگیز

**سەرسووڕێنەر** / sersûřêner/: ئاوەڵناو. سەمەرە؛ سەمەر؛ سەرسووڕێنەر 🇮🇷 شگفت‌انگیز

**سەرسووک** / sersûk/: ئاوەڵناو. سەرسڤک: ١. کەم‌ئەرک ٢. ئاسوودە 🇮🇷 ١. سرخلوت ٢. آسوده

**سەرسووکی** / sersûkî/: ناو. سەرسڤکی: ١. سرخلوت ٢. ئاسوودەیی 🇮🇷 ١. کم‌کاری ٢. آسودگی

**سەرسە پۆل** / sersepol/: ☜ **سەرەسەپۆلە**

**سەرسەخت** / sersext/: ئاوەڵناو. سەرڕەق 🇮🇷 سرسخت

**سەرسەختی** / sersextî/: ناو. سەرگورزی؛ لابەلایی؛ لاساری؛ لایی؛ کەڵەوەکێشی 🇮🇷 سرسختی

**سەرسەرا** / sersera/: ناو. ١. ناودالان؛ شوێنێکی سەرگیراوی گەورە لە دەرگانەی بڕێ ماڵدا کە ئاسانسور و پلیکان و دالانەکانی لێیە ٢. هاڵ؛ دیوێ کە دەرگای ماڵی بە سەردا دەکرێتەوە و لەوێوە بۆ دیوەکانی تر دەچن ٣. لابی؛ تاقمی هاوپەیمان کە بە کارێکەوە خەریکن 🇮🇷 ١و٢. سرسرا ٣. لابی

**سەرسەرەکی** / sersrekî/: ☜ **سەرسەری**

**سەرسەری**[١] / serserî/: ئاوەڵناو. *[پلار]* سەرسەرەکی: ١. چەورە؛ خوێڕی و بێکارە ٢. سەرچڵ؛ ڕواڵەت‌بین ٣. وازوازی؛ وازی- وازی؛ هەردەم لە سەر خەیاڵێک 🇮🇷 ١. بیکاره ٢. سرسری ٣. دمدمی

**سەرسەری**[٢]: ئاوەڵکار. سەرسەرەکی: بێ لێ‌ڕوانین و وردبوونەوە ‹سەرسەری چاوێکی لێ کرد› 🇮🇷 سرسری

**سەرسەکە** / serseke/: ناو. کووزی باریکەڵە لە خەیار و گندووره و شووتی و ... 🇮🇷 قاچ نازک از خیار و هندوانه و...

**سەرسەکەر** / serseker/: ↓

▣ **سەرسەکەر گرتن**: کەڵ گرتن؛ لای کارێک گرتن ‹کوڕەکەت بنێرە! گاهەس سەرسەکەرێکی گرت بۆمان› 🇮🇷 گوشەی کاری را گرفتن

**سەرسەنگ**[١] / serseng/: ناو. پارسەنگ؛ کاری سلاو دانەوەی تەرازوو 🇮🇷 خاطرانه به شکل کمی گران کشیدن ترازو

**سەرسەنگ**[٢]: ئاوەڵناو. *[پلار]* لاسار؛ گوێ‌نەبیس 🇮🇷 خُشک‌سر

**سەرسەنگین** / sersengîn/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ١. ماقووڵ؛ گران ٢. هێندێک عاجز و نادۆستانە

‹لەگەڵماندا سەرسەنگینە› 🇮🇷 ١. متین؛ باوقار ٢. سرسنگین

**سەرسەوز**[1] / sersewz/: ناو. ١. ☜ **سۆنە** ٢. [مەجاز] سەیی؛ ئەولادی پێغەمبەر 🇮🇷 ١. ☜ **سۆنە** ٢. سیّد

**سەرسەوز**[2]: ئاوەڵناو. پڕگیا و دار و زەنوێر 🇮🇷 سرسبز

**سەرسینگ** / sersîng/: ناو. سەرسنگ؛ نێوان هەر دوو مەمکان 🇮🇷 بین دو پستان

**سەرشار** / serşar/: ناو. دوو سەری مەیدانی گەمە 🇮🇷 دوو سرِ زمین بازی

**سەرشان** / serşan/: ناو. ١. ملەی کێو ٢. تێشووی ڕێ ٣. تێشوودان ٤. بەشێ لە جل کە شانی مرۆ دەگرێ 🇮🇷 ١. ستیغ ٢. توشە ٣. توشەدان ۴. سرشانەی لباس

**سەرشانە** / serşane/: ناو. سەرۆک؛ پێچەوانەی بنۆک؛ بەشی هەرەچاکی خوری کە دەکەوێتەوە سەر شانەوە 🇮🇷 بخش مرغوب پشم، کە روی شانە می‌ماند

**سەرشڤ** / serşiv/: ئاوەڵناو. سەرتڵ؛ بژاردە 🇮🇷 گُزیدە

**سەرشکەستی** / serş(i)kestî/: ئاوەڵناو. شەرمەزار؛ خەجاڵەت 🇮🇷 شرمندە

**سەرشکێن** / serş(i)kên/: ناو. ١. کاری بە سەرچڵی ٢. کاری دابەش کردنی شتێک بە سەر چەن ئەندام یان لێ کەم کردنی یەکسان لە چەن ئەندام 🇮🇷 ١. کارِ سرسری ٢. سرشکن

⊡ **سەرشکێن کردن**: دابەش کردنی شتێک بە سەر چەن ئەندام یان لێ کەم کردنی یەکسان لە چەن ئەندام ‹لنگەیەک گەنم ماوە سەرشکێنی کە بە سەر تەلیسەکاندا› 🇮🇷 سرشکن کردن

**سەرشکێنە** / serş(i)kêne/: ناو. سەرەشکێنە؛ کاری پاشماوە، دابەش کردنەوە 🇮🇷 عمل باقیماندەی چیزی را قسمت کردن

**سەرشۆ** / serşo/: ناو. سەرشۆرکە؛ شۆرکە؛ حەمامی ماڵ؛ جێگەی خۆ شتن لە ماڵدا 🇮🇷 حمامِ خانە

**سەرشۆر** / serşor/: ناو. دەلاکی گەرماو 🇮🇷 دلاک حمام عمومی

**سەرشۆرکە** / serşorke/: ☜ **سەرشۆ**

**سەرشۆڕ** / serşoř/: ئاوەڵناو. [پلار] خەجاڵەت؛ شەرمەزار. هەروەها: **سەرشۆڕی** 🇮🇷 شرمسار

**سەرشۆک** / serşok/: ناو. ١. باڵدارێکە چکۆلە، لە تیرەی چۆلەکە ٢. حەمام؛ جێگەی خۆ شتن 🇮🇷 ١. گنجشک‌سانی کوچک ٢. گرمابە

**سەرشە** / serşe/: ناو. سەرشەهـ؛ سەرشانە؛ سەرۆکی خوری و موو کە بە سەر شانەوە دەمێنێ 🇮🇷 پشم یا مویی کە بر شانە می‌ماند

**سەرشەق**[1] / serşeq/: ناو. [پلار] دەسپێشخەری؛ پێشدەستی لە کاردا 🇮🇷 پیشدستی در کار

**سەرشەق**[2]: ئاوەڵناو. [پلار] سەرڕەق؛ سەرسەخت 🇮🇷 سرسخت

**سەرشەهـ** / serşeh/: ☜ **سەرشە**

**سەرشیر** / serşîr/: ☜ **سەرتوێ**

**سەرشیفۆک** / serşîfok/: ناو. باڵدارێکە 🇮🇷 پرندەای است

**سەرشین** / serşîn/: ئاوەڵناو. [مەجاز] پێیڕەش و شووم ‹لۆمەی من دەکەی وەنەوشە! کەچی/ بۆ خۆت سەرشین و دژ و ملکەچی «هێمن»› 🇮🇷 نحس و بدقدم

**سەرشینک** / serşînik/: ناو. مەلێکی پچووکە بە قەد چۆلەکە دەبێ و سەری شینە 🇮🇷 پرندەای کوچک

**سەرشینکە** / serşînke/: ناو. پۆپەڕەشە؛ نەخۆشی مریشکان 🇮🇷 وبای مُرغی

**سەرشێت** / serşêt/: ئاوەڵناو. [پلار] ١. نەترس و دانەسەکناو ٢. حۆل؛ گێلووکە؛ کەمئاوەز ٣. وڕ؛ هووڕ؛ گێژ. هەروەها: **سەرشێتی** 🇮🇷 ١. بی‌احتیاط و جسور ٢. خُل‌مزاج ٣. گیج

**سەرشێلکە** / serşêlke/: ناو. ١. ئەو پەڕۆیەی بە سەر هەویریدا دەدەن، دوای شێلانی ٢. ئەو بەنەی لە ڕاوەکەو، لە بەینی داو و سنگدایە ☰ ١. پارچەای کە روی خمیر نان می‌اندازند ٢. نخی کە در دام کبک بە کار می‌رود

**سەرشێو** / serşêw/: ناو. ١. کاتی نانی بەیانی ٢. کاتی ڕۆژوو کردنەوە ☰ ١. هنگام چاشت ٢. هنگام افطار

**سەرعەرز** / ser'erz/: ئاوەڵناو. تەورلەق؛ دەس‌نەوێساو ☰ بی‌تربیت

**سەرعێل** / ser'êl/: ☜ سەرخێڵ

**سەرف** / serf/: ناو. خەرج؛ مەزیخ؛ بەخت ☰ خرج

**سەرفاقە** / serfaqe/: ناو. سەرەتیر ‹دڵ دەرسات زاناش هۆرئاما بە جەنگ/ گرتە بی بە دەست سەرفاقەی خەدەنگ «بێسارانی»› ☰ پیکان

**سەرفترە** / serfitre/: ☜ سەرفیترە

**سەرفراز** / serf(i)raz/: ئاوەڵناو. سەربەرز؛ سەربڵند ☰ سرفراز

**سەرفرازی** / serf(i)razî/: ناو. سەربەرزی؛ سەربڵندی ☰ سرفرازی

**سەرفەراز** / serferaz/: ☜ سەربەرز

**سەرفیای** / serf(i)yay/: ☜ سەرفین

**سەرفیترە** / serfitre/: ناو. *[ئیسلام]* سەرفترە؛ سەروترە؛ پارە یان ماڵێ کە لە ڕۆژی جێژنی ڕەمەزاندا بە هەژار و فەقیر دەدرێ ☰ فِطریّە؛ زکات فِطر

**سەرفیراز** / serfiraz/: ☜ سەربەرز

**سەرفین** / serfin/: چاوگ. سەرفیای: ١. بەبەهرە بوون؛ قازانج کردن ‹بەو نرخە نایدەم، بۆم ناسەرفێ› ٢. ژیان؛ تیەرزیان؛ هەرزین؛ نرخ هێنان ‹با دانیشین، ناسەرفێ بڕۆین› ☰ ١. صرف کردن ٢. ارزیدن

**سەرڤە** / serve/: ☜ سەرو

**سەرقاپ** / serqap/: ناو. ١. سەرقەپاغ؛ سەرقەپاخ؛ سەرپۆشی دەفر ٢. سەرقاو؛ چێشتی زیادەی سەر خوان بۆ ئەوانەی زیاتر دەخۆن ☰ ١. سرپوش ظرف ٢. غذای اضافەی سر سفرە

**سەرقافڵە** / serqafłe/: ناو. کاروانشان؛ سەرۆکی کاروان ‹مەپەرسۆ ئازیز پڕ وەفا و بەینەت/ کۆن تاجرباشی سەرقافڵەی مەینەت «مەولەوی»› ☰ ساربان

**سەرقاڵ** / serqał/: ئاوەڵناو. ١. خەریکی کار ٢. سەرجەنجاڵ. هەروەها: **سەرقاڵی** ☰ ١. سرگرم ٢. پُرمشغلە

**سەرقاو** / serqaw/: ☜ **سەرقاپ ـ٢**

**سەرقرتاو** / serqirtaw/: ئاوەڵناو. کرتی ☰ سرچیدە (گیاه)

**سەرقژن** / serqijin/: ئاوەڵناو. سەرقژیلکە: ١. مووئاڵۆزی تێکەڵ ـ پێکەڵ ٢. *[مەجاز]* جندۆکە؛ جنۆکە ☰ ١. ژولیدەمو ٢. جن

**سەرقژیلکە** / serqijîlke/: ☜ سەرقژن

**سەرقفڵانە** / serqiflane/: ناو. سەرقفڵی؛ پارەیەک کە خاوەن دوکان لە کاتی کرێ دانیدا لە کرێنشینی دەستێنێ ☰ سرقُفلی

**سەرقفڵی** / serqiflî/: ☜ سەرقفڵانە

**سەرقوت** / serqut/: ناو. کاری کوتانی گەنم بە تەواوی ☰ نیمکوبی گندم بلغور

**سەرقورس** / serqurs/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ١. تەوەزەل؛ تەمبەڵ ٢. ☜ **سەرڕەق** ☰ ١. تنبل ٢. ☜ سەرڕەق

**سەرقول** / serqul/: ناو. جگێ ناو دوو پەنجە، کە لە جگێندا بە پیرۆزی دەزانن ☰ شتالنگی کە در بازی برای آمد نگە می‌دارند

**سەرقولە** / serqułe/: ناو. جۆرێ ترێ ☰ نوعی انگور

**سەرقۆپ** / serqop/: ناو. سەرقەل؛ دوند؛ ترۆپک ☰

قُله؛ اوج
**سەرقۆت** / serqot/: ئاوەڵناو. سەرقۆتی؛ سەرقۆتین؛ سەرخواس؛ سەرڕووت ☰ سربرهنه
**سەرقۆتی** / serqotî/: ☜ سەرقۆت
**سەرقۆتین** / serqotîn/: ☜ سەرقۆت
**سەرقۆز** / serqoz/: ئاوەڵناو. شاد و دڵخۆش ☰ شادمان
▣ **سەرقۆزی بن ئالۆن**: دەسکورت و خەمبار، بەلام بە ڕواڵەت دارا و دڵخۆش ☰ خندان لب و خونین دل
**سەرقۆش** / serqoş/: ناو. قەیاسە؛ باربەندی پان لە چەرم ☰ باربند پهن چرمی
**سەرقۆق** / serqoq/: ئاوەڵناو. کەلەش؛ کەچەڵ ☰ کچل
**سەرقۆڵ** / serqoł/: ناو. سەرقۆڵە: ١. دارۆغە؛ سەردەستەی پاسەوانان ٢. سەردەس؛ جلکی جومگە پۆش ☰ ١. سرنگهبان ٢. سرآستین
**سەرقۆڵە** / serqołe/: ☜ سەرقۆڵ
**سەرقەباغ** / serqebağ/: ناو. سەرگیرفان؛ پارچەیێ کە بە سەر گیرفاندا دەیدروون و بە دوگمە دادەخرێ ☰ روجیبی لباس
**سەرقەبران** / serqebran/: ناو. قەبرستان؛ زیارەتان؛ قەبران؛ سەرقەوران؛ گۆڕستان ☰ گورستان
**سەرقەپاخ** / serqepax/: ☜ سەرقاپ ـ١
**سەرقەپاغ** / serqepağ/: ☜ سەرقاپ ـ١
**سەرقەتار** / serqetar/: ناو. ١. پێشەنگی کاروان ٢. سەرۆکی کاروان ‹قەتارێ هاتووە گەوهەر باریەتی/ خورشیدی خاوەر سەرقەتاریەتی «فولکلۆر»› ☰ ١. پیشاهنگ کاروان ٢. قافلەسالار
**سەرقەل** / serqel/: ☜ سەرقۆپ
**سەرقەلەن** / serqelen/: ☜ سەرنەخت
**سەرقەڵانگ** / serqełang/: ناو. خەلەی تینووی سەر لە تینوان چەماو ☰ ساقەی از بی‌آبی خم شده
**سەرقەڵەم** / serqełem/: ناو. گەورە نووسەری میری ☰ مُنشی‌باشی
**سەرقەڵەمانە** / serqełemane/: ناو. حەق دەستی نووشتەنووس ☰ مُزد دُعانویس
**سەرقەوران** / serqewran/: ☜ سەرقەبران
**سەرقەوی** / serqewî/: ئاوەڵناو. *[پەلار]* سەرزل؛ کەلەزل ☰ سرگُنده
**سەرک** / ser(i)k/: ناو. ١. سەرقەپاخ؛ سەرپۆشی دەفرۆکە ٢. سەری جیاوەبووی گیاندار ‹کەروێشکەکەیان سەربڕی و سەرکەکەیان فڕێ دا› ٣. ☜ سەلك ـ٣ ☰ ١. سرپوش ظرف کوچک ٢. سر بُریدەی حیوان ٣. ☜ سەلك ـ٣
**سەرکاب** / serkab/: ناو. ئاواڵ کراس؛ جلێ ژنانە کە لە کەلەکە بەرەخوار دادەپۆشێ ☰ دامن
**سەرکار** / serkar/: ناو. سەرەوکار؛ کاربەدەستی ئاغا؛ کەسێ کە لە لایەن ئاغاوە بە خەلە و خەرمان ڕادەگا ‹خزمەتکار ئاغا، پێی ئەڵێن سەرکار/ دەمانچە لە پشت، خەنجەر جەوهەردار «قانع»› ☰ مُباشر
**سەرکارانە** / serkarane/: ناو. باجێ کە ڕایەت دەیدا بە سەرکار ☰ مُزدی که رعیت به مُباشر ارباب می‌دهد
**سەرکاروان** / serkarwan/: ناو. قافڵەچی ☰ سر کاروان
**سەرکان** / serkan/: ناو. ١. بنڕەتەوە؛ دامەزرێنەری بنەماڵەیەک لە پادشایان ٢. پێشەوا؛ سەرپەل؛ سەرداوکە؛ داڵقوور؛ پێشەنگ و دەسپێکەری کارێ کە دەستەیەکی پێوە پەرژاون ☰ ١و٢. سرسلسله
▣ **سەرکانی ئێلی**: سەرەکهۆز؛ سەرکردە ☰ رئیس طایفه
**سەرکانی** / serkanî/: ☜ سەروکانی

**سەرکاو** / serkaw/: ناو. کۆسار؛ کوێستان؛ کێفسان ‹گێج سەرکاوان جە سەردی بین کەیل/ بۆ مەدان چوون بۆی بێوەفایی لەیل «مەولەوی»› ≡ کوهسار

**سەرکراوە** / serk(i)rawe/: ئاوەڵناو. سەرواز؛ سەرئاوەلا ≡ سرباز

**سەرکردە** / serkirde/: ناو. فەرماندەی لەشکر ‹کوردستانی ئێمە ئاشە و سەرکردەکانیشی ئاشەوان، کورد باراشە و هاڕینەکەی بە قۆنتەرات دراوە بەوان «پەشێو»›. هەروەها: **سرکردەیی** ≡ فرمانده

**سەرکرێ** / serk(i)rê/: ناو. شتێک زێدە لە مزی ڕۆژانە یان مانگانە ≡ اضافەحقوق

**سەرکڕنیک**[1] / serkiřnîk/: ناو. جندۆکە؛ جنۆکە ≡ جن

**سەرکڕنیک**[2]: ئاوەڵناو. /مەجاز/ بەدفەڕ؛ شووم؛ جووتقۆشە ≡ نحس

**سەرکڕینک** / serk(i)řînik/: ناو. جن؛ جنۆکە؛ جندۆکە ≡ جن

**سەرکز** / serkiz/: ئاوەڵناو. /مەجاز/ ١. خەمین ‹قانع بە دەستی چەرخەوە وا مات و سەرکزە/ بێهێز و بێتەکانە لە ماری کوژراو ئەکا «قانع»› ٢. پەشێو؛ ژاکاو ≡ ١. غمگین ٢. افسُرده

**سەرکزۆلە** / serk(i)zûle/: ئاوەڵناو. /مەجاز/ پووتەکە؛ بێنموود ≡ لاغرمردنی

**سەرکزی** / serk(i)zî/: ناو. /مەجاز/ لارەملی و خەمباری ≡ گردن‌کجی و غمگینی

**سەرکل** / serkil/: ناو. ١. سەرکلە؛ سەرکلۆم؛ چفتی دەرگا داخستن لە ژوورەوە ٢. سەرکول؛ تەرسەقول؛ قەرسەقول؛ قارسەقول ≡ ١. چفت در ٢. سرگین اُلاغ

**سەرکلە** / serk(i)le/: ☜ **سەرکل-١**

**سەرکڵ** / serkił/: ناو. سەرئاورگە ‹سەرکڵی جەهەندەم› ≡ روی آتشدان

**سەرکڵاو** / serk(i)ław/: ☜ **سەرکڵاوە**

**سەرکڵاوە** / serk(i)ławe/: ناو. سەرکڵاو: ١. ماشێنەی جێ پلیتەی لامپا ٢. کڵاوی خوری بۆ کاتی بەفر و باران ٣. دوند؛ نووک؛ ترۆپک ≡ ١. جای فتیله در چراغ نفتی ٢. کلاه پشمی ٣. قُلّه

**سەرکڵۆم** / serk(i)łom/: ☜ **سەرکل-١**

**سەرکنەک** / serk(i)nek/: ناو. هەڵۆ ≡ عقاب

**سەرکوت** / serkut/: ناو. ١. تەپەسەری؛ کاری دامرکاندنی هێز و پێز بە زۆری ‹ڕاپەڕینی جووتیارانی زۆر بێڕەحمانە و بە توندی سەرکوت کرد «هێمن»› ٢. لۆمە و تانەی بە تووڕەییەوە ≡ ١. سرکوب ٢. نکوهش

**سەرکوتکراو** / serkutk(i)raw/: ئاوەڵناو. تەپەسەر؛ سەرکۆنەکراو؛ دامرێندراو ≡ سرکوب شده

**سەرکوتیلک** / serkutîlik/: ناو. گیایەکە بۆ لەوەڕ ≡ علفی است

**سەرکوزۆلە** / serkuzole/: ئاوەڵناو. قژنەسەرە؛ سەرقژن ≡ ژولیده‌مو

**سەرکول** / serkul/: ☜ **سەرکل-٢**

**سەرکوڵ** / serkuł/: ناو. ١. بەرکول؛ نیوەکوڵ؛ تۆزە چێشتێ کە پێش کوڵینی دەیچێژن ٢. باشترین بەشی چێشت کە لە سەر تیانەوە هەڵیدەگرن ≡ ١و٢. سرجوش

**سەرکوڵمە** / serkułme/: ناو. دیمە؛ گوپ؛ لۆپ ≡ گونە

**سەرکونسوول** / serkunsûl/: ناو. سەرۆکی کونسوولگەریی ولاتێ لە ولاتێکی‌تر ≡ سرکنسول

**سەرکونسوولی** / serkunsûlî/: ناو. ١. کار و باری سەرکونسوول ٢. ئەو شوێنەی سەرکونسوول کاری تێدا دەکا ≡ ١و٢. سرکنسولگری

**سەرکوێر** / serk(i)wêr/: ئاوەڵناو. ١. /پلار/ دەبەنگ؛ نازیرەک؛ تێنەگەیشتوو ٢. ترشاو بە شێوەیێ کە بە جوولە یان دەس ڕاوەشاندنێک بچڵەکێتەوە (چارەوێ) ≡ ١. کودن ٢. ترسیده و رموک (استر)

◘ **سەرکوێر کردن**: ١. زۆر ترساندن و مێشک لە کار خستن ٢. ترساندنی وا کە بە جوولەیەک بچڵەکێتەوە (چاروا). هەروەها: **سەرکوێر بوون** ⯀ ١. سرکوفت زدن ٢. ترساندن و رموک کردن (استر)

**سەرکوێزر / serk(i)wêzir/**: ☜ **سەرکۆزەر**

**سەرکۆ / serko/**: ناو. ١. گەنمی سەرەوەی خەرمان ٢. سەرزەنشت؛ سەرکۆنە ٣. سەر کێو؛ سەر شاخ ‹جه دووریی قامەت زولف ئەشەدبوان/ بێزارم جه گشت سەیر سەرکۆوان «بێسارانی»› ⯀ ١. گندم بالایی تودەی خرمن ٢. سرزنش ٣. قُلەی کوه

**سەرکۆپ / serkop/**: ناو. کڕنووش؛ کاری داهاتنەوە بۆ ڕێز لێنان ⯀ تعظیم

**سەرکۆت / serkot/**: ناو. سەربێژنگ لە کاتی دەغڵ گێژەو کردندا ⯀ دانەهای درشت غلّە روی غربال

**سەرکۆتەڵ / serkoteł/**: ☜ **سەرکۆزەر**

**سەرکۆزر / serkozir/**: ☜ **سەرکۆزەر**

**سەرکۆزەر / serkozer/**: ناو. سەرکوێزر؛ سەرکۆزر؛ سەرکۆتەڵ؛ کۆتەڵ؛ گوڵە خەڵەی بەرگێرە نەکەوتووی درشت ‹لەو خوارە لە بیابان، لە هەرکوێیەک/ هێلکێک خۆڵ ببێژنەوە!/ ئەبێ لە سەرکۆزەرەی هێلەکدا/ هەر وردەئێسک و لووولاقی کوردێکی تێیا بدۆزنەوە «شێرکۆ»› ⯀ تەماندەی غلّە پس از بیختن

**سەرکۆڵ[1] / serkoł/**: ناو. ١. پاچەکۆڵە؛ جۆرێ قولینگی دەمکوڵ ٢. سەرکۆڵەکە؛ داری نێوان ئەستوون و بان ⯀ ١. نوعی کلنگ لبە کند ٢. سرستون

**سەرکۆڵ[2]**: ناوەڵناو. سەرپەتی؛ سەرقوت؛ سەرڕووت ⯀ سربرهنه

**سەرکۆڵەکە / serkołeke/**: ☜ **سەرکۆڵ[1]ـ٢**

**سەرکۆما / serkoma/**: ناو. سەرکۆ؛ گەنمی سەرەوەی خەرمان ⯀ گندم بالایی تودەی خرمن

**سەرکۆمار / serkomar/**: ناو. ١. سەرۆک‌کۆمار؛ گەورەی وڵات، کە بۆ ماوەی چەند ساڵ لە لایەن خەڵکەوە هەڵدەبژێردرێ ٢. کاربەدەست و دەسەڵاتداری چەند هۆز و عەشیرەت ‹سیامال ماتەم سەرکۆمار دڵتەنگ/ تەڵەبە پەشێو مەدرەسە بێدەنگ «مەولەوی»› ⯀ ١. رئیس‌جمهور ٢. بزرگ چند تیره و طایفه

**سەرکۆنە / serkone/**: ناو. سەرکۆ؛ سەرکۆنە؛ لۆمە ⯀ سرزنش

**سەرکۆنەکراو / serkonek(i)raw/**: ☜ **سەرکوت‌کراو**

**سەرکەپیاز / serkep(i)yaz/**: ☜ **سەلکەپیاز**

**سەرکەتەشی / serketeşî/**: ☜ **سەرتەشی**

**سەرکەتیفە / serketîfe/**: ناو. قەڕنیز؛ قەڕنیز ⯀ قرنیز

**سەرکەسک / serkesk/**: ☜ **سۆنە**

**سەرکەش / serkeş/**: ناوەڵناو. سەرکێش: ١. سەربزێو ‹ئەسپی سەرکەش› ٢. زۆر بڵند؛ بەرزی بەرز ‹بە شەو بای چیای بلند و سەرکەش/ ڕەنگی پەلکی من بووە سوور و گەش «هێمن»› ⯀ ١و٢. سرکش

**سەرکەشکە / serkeşke/**: ☜ **شالوور**

**سەرکەشی / serkeşî/**: ناو. ١. سەربزێوی؛ سەربزۆکی؛ مکوڕی ٢. کار و ڕەوتی پێڕاگەیشتن ⯀ ١. تمرُّد ٢. رسیدگی

**سەرکەف / serkef/**: ناو. ١. تاویاوەی سەرکەوتووی پیو لە سابوون چێ‌کردندا ٢. خوێی هەرەسپی و جوان لە خوێڵێن، کە لە ڕزنی سەرووەدایە ⯀ ١. گُداختەی پیە در کار صابون‌سازی ٢. نمک مرغوب در نمکزار

**سەرکەڵ / serkel/**: ناو. ١. سەری چیا؛ بان کێف ٢. سەری ملە؛ بان کەل ⯀ ١. بالای کوه ٢. سر گردنه

**سەرکەللە** / serkelle/: ☜ **سەرکەلە**

**سەرکەلە** / serkele/: ناو. سەرکەللە: ١. بەشی سەرەوەی ڕەشمە کە بە دەوری سەر و ژێر چەنەی یەکسمدا دێت ٢. پارچەیەک لە ڕەشماڵ کە کورتایی تەواو دەکا ‹لە پەشمی ڕیخناکی بەر سمێلت/ نەڕێسن سەرکەلە و دەسبەند و هەوسار «شێخ ڕەزا»› ▬ ١. جای بند افسار، دور سر و زیر چانەی سُتور ٢. تکەای از سیاەچادر

**سەرکەڵ** / serkeł/: ناو. دەستەکی چیغ قایم کردن ▬ چوبی کە چیغ را نگە میدارد

**سەرکەنە** / serkene/: ناو. گوریسی دابەستنی سەر عەڕەبانە بۆ کلۆش کێشان ▬ ریسمانی کە در ساقەکشی بە کار آید

**سەرکەوا** / serkewa/: ناو. جۆرێ جلی ژنانەیە، پەراوێزەکانی بە سیم دەنەخشێنن ▬ نوعی روپوش حاشیەدوز زنانە

**سەرکەوتو** / serkewtû/: ئاوەڵناو. سەرکەوتە؛ بە ئاکام گەیشتوو ▬ موفق

**سەرکەوتویی** / serkewtûyî/: ناو. غەڵەبایی؛ غەلەبە؛ چیری؛ زاڵی ▬ چیرگی

**سەرکەوتە** / serkewte/: ☜ **سەرکەوتو**

**سەرکەیف** / serkeyf/: ئاوەڵناو. کەیفخۆش؛ سەرحاڵ ▬ سرزندە

**سەرکێش** / serkêş/: ☜ **سەرکەش**

**سەرکێشک** / serkêşik/: ناو. ڕەئیسی ئێشکگران ▬ سرکشیک

**سەرکێشی** / serkêşî/: ناو. سەرکەشی: ١. سەربزێوی؛ نافەرمانی ‹سەرکێشی ئۆتۆمبێلەکان تۆمار دەکرێت› ٢. کاری سەردان لە کەسێ یان شتێ ‹کانی هەمرۆ ئی نە سەری ڕاتەن/ سەرکێشی کەرە گیانم فیداتەن «ئاغا عینایەت»› ٣. کار و ڕەوتی پێڕاگەیشتن ‹جاروبار سەرکێشی منالەکان بکە!› ▬ ١. نافرمانی ٢. عمل سر زدن بە کسی یا چیزی ٣. رسیدگی

**سەرگ** / serig/: ئاوەڵناو. لای ژووروو ‹سەفی سەرگ› ▬ بالایی

**سەرگاوێک** / sergawîk/: ناو. گیایەکە دەخورێ ▬ گیاهی خوردنی

**سەرگر** / sergir/: ناو. ١. کەسێ کە حەیوانی مێوینە دەگرێ، بۆ جووت کردن دەگەڵ نێرەکەیدا ٢. [کنایە] دەویت؛ گەواد ▬ ١. کسی کە حیوان مادە را برای جُفت کردن با نر آن میگیرد ٢. جاکش

**سەرگران** / serg(i)ran/: ئاوەڵناو. ١. [پلار] تەمەڵ؛ تەوەزەل ٢. مەس؛ سەرخۆش ‹چەن سواری هەیە کە شێر ئەدڕن/ چەندە بێباک و سەرگرانی هەیە «قانع»› ٣. [کنایە] ڕانەهێنراو (ئەسپ) ▬ ١. تنبل ٢. مست ٣. رامنشدە (اسب)

**سەرگرتە** / sergirte/: ناو. خلیسکاو؛ خزیاگ ▬ لیزخوردە

**سەرگندان** / sergindan/: ئاوەڵناو. داماو؛ پەشێو ▬ سرگردان

**سەرگورز** / sergurz/: ئاوەڵناو. [پلار] سەرزل؛ کەللە ▬ سرگُندە

**سەرگورزی** / sergurzî/: ناو. [پلار] ١. لاساری؛ سەرسەختی ٢. تووڕەیی؛ تۆسنی ▬ ١. لجاجت ٢. تُندخویی

**سەرگورشتە** / serguri̇şte/: ☜ **سەرگوروشتە**

**سەرگوروشتە** / serguruşte/: ناو. سەرگورشتە؛ سەرگوریشتە؛ سەرگوزەشتە؛ چیرۆکی ڕابوردە ▬ سرگذشت

**سەرگوریشتە** / sergurîşte/: ☜ **سەرگوروشتە**

**سەرگوزەشتە** / serguzeşte/: ☜ **سەرگوروشتە**

**سەرگوشاد** / serguşad/: ئاوەڵناو. سەرئاواڵە؛ بێسەرپۆش ▬ سرگُشادە

**سەرگوڵ**[١] / sergul/: ناو. ١. هەوەڵ چا لە چادان

‹چاییەکی تازەم دەم کردووە، سەرگولەکەی بۆ تۆ› ۲. هەڵبژاردەی بێ کەمایەسی ☰ ۱. اولین چای از قوری ۲. انتخاب احسن

**سەرگوڵ**[۲]: ناوەڵناو. باشترین بەشی هەر شتێ ‹هات سەرگوڵی دۆڵمەکەی خوارد و چوو!› ۳ ☰ برگُزیده

**سەرگوم / sergum/**: ناوەڵناو. سەرداگوم؛ ون؛ بێسەروشوێن ☰ گُم

⊡ **سەرگوم کردن:** شێواندن؛ پەشێو کردن ☰ سردرگُم کردن

**سەرگوێلک / serg(i)wêlik/**: ☜ **سەرانگوێلک**

**سەرگۆ / sergo/**: ناو. ۱. ☜ **سەرانگوێلک** ۲. تەپاڵدان؛ شوێنی ڕاگرتنی تەپاڵە ۳. سەری شت یا جێگای خڕ ☰ ۱. ☜ **سەرانگوێلک** ۲. تاپالەدان ۳. انتهای گردی

**سەرگۆت / sergot/**: ☜ **سەربردە**

**سەرگۆڕی / sergorî/**: ناو. هژمە؛ گۆڕی و قوربان؛ گیانفیدا ☰ فدایی

**سەرگۆز / sergoz/**: ناو. ڕۆپل؛ هەڵپیت ☰ هَرَس

**سەرگۆم / sergom/**: ناوەڵناو. ڕیوەڵە و بێنموود (گیسک) ☰ لاغر بدنمود (بُز)

**سەرگەرد / sergerd/**: ناو. [مەجاز] ۱. قەزاگر؛ بەلاگەردان ‹من بیم خەریدار کالای بالاکەت/ من بیم وە سەرگەرد گەردی پالاکەت «مەولەوی»› ۲. گۆڕی؛ قوربانی ‹شەرت بۆ چون فەرهاد شێت دەروەدەر/ وێم کەم وە سەرگەرد خاڵان دڵبەر «تاهیربەگ»› ☰ ۱. بلاگردان ۲. قُربان

**سەرگەردان / sergerdan/**: ناوەڵناو. [مەجاز] ۱. پەشێو؛ داماو ‹لەناو قەومێکی جاهیلدا ئەوی یەک زەڕڕە فیکری بێ/ ژیانی زەحمەتە بێکەس! کە سەرگەردانە تا مردن «بێکەس»› ۲. ئاوارە؛ دەربەدەر ‹جێ و مەوتەنی من پرسن: هەر چۆلگەوو سارایە/ مەجنوونم و سەرگەردان، لەو بەندەن و شاخانەم «ئاوات»›. هەروەها: **سەرگەردانی** ☰ ۱و۲. سرگردان

⊡ **سەرگەردان بوون:** قەوچە بوون؛ دامان ☰ سرگردان شدن

**سەرگەرم / sergerm/**: ناوەڵناو. [مەجاز] ۱. خەریکی کار ۲. تووڕە و تۆسن ۳. سەرخۆش ☰ ۱. مشغول کار ۲. تُندخوی ۳. مست

**سەرگەرمی / sergermî/**: ناو. [مەجاز] ۱. لیستەک؛ خۆخلافکێ؛ کازە؛ چالاکییەک بۆ ڕابواردن، خۆ خلافان و حەسانەوەی زەین ‹لاوان پێویستیان بە سەرگەرمی هەیە› ۲. مژولاهی؛ خەریکی؛ پژگاڵ؛ مژولی؛ دۆخ یان چۆنیەتی سەرپەرژان؛ خەریک بوون ‹سەرگەرمی من کتێب خوێندنەوەیە و بەس› ☰ ۱و۲. سرگرمی

**سەرگەڕ / sergeř/**: ☜ **سیسارگ**

**سەرگەشتە / sergeşte/**: ناوەڵناو. [مەجاز] سەرلێشێواو؛ سەرسڕماو ‹مەی حەلالە بۆ منی وێرانەماڵ/ بۆ منی سەرگەشتە و رووت و ڕەجاڵ «هێمن»› ☰ سرگشته

**سەرگەڤار / sergevar/**: ☜ **سەرگەورە ـ۱**

**سەرگەڤاز / sergevaz/**: ☜ **سەرگەورە ـ۱**

**سەرگەلە / sergele/**: ناو. ڕەمکێش؛ پێشەنگی مێگەل ‹دائیم لە دووتە مێگەلی ژن، نێرگەلی پیاو/ بەم ڕیشەوە لە پێشەوە بووگی بە سەرگەلە! «نالی»› ☰ پیشاهنگ گله

**سەرگەلا / sergeła/**: ☜ **سەربەلک**

**سەرگەنیگ / sergenîg/**: ناوەڵناو. [پلار] گەڕ؛ کەل؛ کەچەل ☰ کچل

**سەرگەورە / sergewre/**: ناو. [کینایە] ۱. سەرگەڤار؛ سەرگەڤاز؛ سەرۆکی خێزانی ماڵ ۲. یەکمان؛ سەردەستە ‹تەماشا ئەکەم بەرزە دەماخم/ لە ناو شاخانا سەرگەورەی شاخم! «قانع»› ☰ ۱. رییس خانواده ۲. سردسته

**سەرگیراو / sergîraw/**: ناوەڵناو. داخراو ☰

سرپوشیده

**سەرگیرفان** / sergîrfan/: ☜ **سەرقەباغ**

**سەرگین** / ser(i)gîn/: جێناو. بڵندتر؛ ئەوی لە بالایە ⇐ بالایی

**سەرگین** / sergîn/: ناو. سەنێر؛ شیاکە؛ ڕیخ ‹زۆر نەمابوو بۆنی سەرگین بمکوژێ، وا تێدەگەم/ تووکی بن‌کلکی کەر و بارگیری مردووی پێوە بوو «شێخ ڕەزا»› ⇐ سرگین

**سەرگیندان** / sergîndan/: ناو. ژوورێکە لە گەوڕ کە پەینی تێدا هەڵدەدەنەوە، بۆ وشک بوون ⇐ اتاق خُشک کردن سرگین در طویله

**سەرگێجە** / sergêce/: ناو. سەرەگێژە؛ سەرگێژە؛ سەرەگێجە ⇐ سرگیجه

**سەرگێرە** / sergêre/: ناو. بنە؛ گای پێشەوە لە گێرەدا ⇐ گاو پیش در خرمنکوبی

**سەرگێڕ** / sergêř/: ناو. پەچە؛ حەوشێکی لە تامان، بۆ ماڵات تێ‌کردن ⇐ حصار نگهداری دام

**سەرگێژە** / sergêje/: ☜ **سەرگێجە**

**سەرگێژی** / sergêjî/: ناو. وڕی؛ گێژی ⇐ گیجی

**سەرلق** / serliq/: ناو. ۱. سەرلک؛ لکەداری سەرەوە ‹سەرانسەری چەم داری ژاڵەیە/ ئەو داوێن سەوزەی سەرلق ئاڵەیە «گۆران»› ۲. فەرماندەی سەد پێشمەرگە ۳. جۆرێ هەنار ⇐ ۱. شاخەی بالایی درخت ۲. فرماندەی صد پیشمرگ ۳. نوعی انار

**سەرلک** / serlik/: ☜ **سەرلق ـ۱**

**سەرلووتکە** / serlûtke/: ناو. سەرقولە؛ سەرکولاوە؛ سەری شاخ ⇐ قلەی کوه

**سەرلەبەر**[1] / serleber/: ئاوەڵناو. ملکەچ؛ شەرمەزار ‹یاخوا سەرلەبەری ماڵ و منداڵ نەبی› ⇐ شرمنده

**سەرلەبەر**[2]: ئاوەڵکار. تێکڕا؛ هەموو؛ گشت ‹گیانلەبەر هەرچی لە سەر ڕووی زەوییە/ سەرلەبەر جیرەبەری خوانی وییە «حەقیقی»› ⇐ همه

**سەرلەپ** / serlep/: ناو. چەپۆکانی ئەسپ ⇐ چراغپا؛ عمل سرپا ایستادن اسب

**سەرلەشکر** / serleşkir/: ناو. سەرکردە؛ فەرماندەی لەشکر ⇐ سرلشکر

**سەرلەشکەر** / serleşker/: ناو. ژێنراڵ؛ جنراڵ؛ ژنراڵ ⇐ ژنرال

**سەرلەنوێ** / serlen(i)wê/: ئاوەڵکار. ژنوو؛ لە سەرەوە؛ لەسەرڕا ‹دەستم کرد بە خوێندن و سەرلەنوێ بوومەوە فەقێ «هێمن»› ⇐ از نو؛ دوباره

**سەرلێشێواو** / serlêşêwaw/: [مەجاز] سەرگەردان؛ ئاڵۆز؛ چارچاف ⇐ سرگردان

**سەرلێشێواوی** / serlêşêwawî/: ناو. [مەجاز] ئاڵۆزی؛ گێژ و وێژی ⇐ سرگردانی

**سەرڵەپک** / serłepk/: ناو. پەتی زاربێنی خێگە ⇐ بند دهانەبند خیک

**سەرما** / serma/: ناو. زام؛ زما؛ سەردا؛ دەمای خوارتر لە ڕادەی ئاسایی یان دڵخواز ⇐ سرما

▣ **سەرما بردن:** سەرما کار لێ‌کردن ⇐ سرمازده شدن

**سەرما بزووتن:** سەرما هاتن؛ دەستپێکردنی سەرما ‹شەوێ پێم وت چلۆنی یاری دێرین/ ئەوا سەرما بزووت دەستم بە دامان «قانع»› ⇐ سرما رسیدن

**سەرما بوون:** ۱. نەخۆش کەوتن لە سەرمان ۲. لەش هەست بە سەرما کردن ⇐ ۱. سرما خوردن ۲. احساس سرما کردن

**سەرما خواردن:** تووشیاری هەلامەت بوون ⇐ سرما خوردن

**سەرمابردگ** / sermabirdig/: ☜ **سەرمابردوو**

**سەرمابردوو** / sermabirdû/: ئاوەڵناو. سەرمابردگ؛ سەرمابردە: ۱. سەرماڵی‌داو ۲. [پ‌لار] سەرمابردەڵ؛ سەرمابردەڵە؛ سارۆکی؛ سەرمایی؛ هەستۆک بە سەرما ⇐ ۱. سرمازده ۲. سرمایی

**سەرمابردە** / sermabirde/: ☜ **سەرمابردوو**

**سەرمابردەڵ / sermabirdeł/:** ☜ **سەرمابردوو-٢**

**سەرمابردەڵە / sermabirdełe/:** ☜ **سەرمابردوو-٢**

**سەرماتۆپێن / sermatopên/:** ئاوەڵناو. سەرماگێڕەوە؛ تایبەتمەندی جلی زۆر گەرم ‹کۆتی سەرماتۆپێن› ☰ ضد سرما

**سەرماخوردەیی / sermaxurdeyî/:** ناو. درم؛ زوکام ☰ سرماخوردگی

**سەرمادەر / sermader/:** ناو. ساردکەر؛ چیلێر ☰ سردکُن

**سەرمازەڵە / sermazełe/:** ناو. خەمەگرۆ؛ جۆرێ مارمێلکە ☰ چلپاسە

**سەرماقۆتانی / sermaqotanî/:** ☜ **سەرمەقولات**

**سەرماگێڕەوە / sermagêřewe/:** ☜ **سەرماتۆپێن**

**سەرماڵێداو / sermalêdaw/:** ☜ **سەرمابردوو -١**

**سەرماڵ / sermał/:** ناو. سەرمایە؛ سەرمیان ☰ سرمایە

**سەرماوسۆڵ / serma w soł/:** ☜ **سەرماوسۆڵە**

**سەرماوسۆڵە / serma w sołe/:** ناو. سەرماوسۆڵ؛ سەرما و بەستەڵەک؛ دەمی زۆر سارد و پڕسەرما ☰ سرما و یخبندان

**سەرماوەز / sermawez/:** ناو. سیخوار؛ قەوس؛ هەیهۆت؛ ئازەر؛ ساران؛ هۆسار؛ خۆسار؛ گاڤۆر؛ نۆهەمین مانگی ساڵی ئێرانی، ئاخرمانگی پاییز کە ٣٠ ڕۆژە ☰ آذر ماه

**سەرمایە / sermaye/:** ناو. سەرمیان؛ دەسمایە؛ دەزمایە؛ دەستمایە: ١. سەرماڵ؛ سەرمیان؛ تەنخوا؛ کۆمەڵە دارایییەک کە بۆ دابینی داهات بە کار دەچێ ‹سەرمایەی شیرکەت› ٢. *[مەجاز]* هەیاتی؛ دارایی، چ مادی و چ مەعنەوی ‹سەرمایەی زانستی› ☰ ١و٢. سرمایە

**سەرمایەدار / sermayedar/:** ئاوەڵناو. دەوڵەمەند؛ دەوڵەمەن؛ سەرمایەدار؛ دارا؛ بوودە؛ زەنگین؛ مایەدار؛ مایەبۆش ☰ سرمایەدار

**سەرمایەداری / sermayedarî/:** ناو. کاپیتالیسم ☰ کاپیتالیسم

**سەرمایی[١] / sermayî/:** ناو. سەرساخ ☰ سلامت

**سەرمایی[٢]:** ئاوەڵناو. سەرمابردەڵە؛ سارۆکی؛ سەردەوچ (بۆ نێر)؛ سەردوچە (بۆ مێ)؛ زۆر هەستۆک بە سەرما و کەمبەرگە لە بەرامبەر سەرماوە ☰ سرمایی

**سەرمردوولە / sermirdûle/:** ئاوەڵناو. *[کینایە]* شەرمێون و فەقیرۆکە ☰ کمرو

**سەرمژانە / serm(i)jane/:** ناو. سەرەمژانە؛ دارێکی کورتە لە نێوان نیر و ئامووردا ☰ چوبک رابط خیش و یوغ

**سەرمک / sermik/:** ئاوەڵکار. پێکەوە؛ تێکڕا؛ سەرجەم ☰ جمعاً

**سەرمل / sermil/:** ناو. سەرپیل؛ شان ☰ کتف

**سەرملە / serm(i)le/:** ناو. زینوو؛ ملەی کێو ☰ سر گردنە

**سەرملەگیر / serm(i)legîr/:** ناو. ڕێگر؛ چەتە ☰ راهزن

**سەرموقولات / sermuqulat/:** ☜ **سەرمەقولات**

**سەرموقولانج / sermuqulanc/:** ☜ **سەرمەقولات**

**سەرمۆر / sermor/:** ☜ **سەربەمۆر**

**سەرمەزد / sermezd/:** ناو. کاپیتان؛ سەردەستەی گەمەکەران ☰ کاپیتان

**سەرمەزن[١] / sermezin/:** ناو. سەرگەورەی هۆز ☰ رییس ایل

**سەرمەزن[٢]:** ئاوەڵناو. سەرزل؛ سەرگەورە ☰ سرگُندە

**سەرمەس / sermes/:** ☜ **سەرمەست**

**سەرمەست / sermest/:** ئاوەڵناو. سەرمەس؛ سەرخۆش؛ مەست. هەروەها: **سەرمەستی** ☰ سرمست

**سەرمەشق / sermeşq/:** ناو. نووسراوەیەک بۆ مەشق کردن لە ڕوویەوە. هەروەها: **سەرمەشق**

دادان ☰ سرمشق

**سەرمەشقانە** / sermeşqane/: ناو. سەرمەشقانێ؛ سەرمەشکانە؛ شەرمەشکانە؛ دیارییەک زاوا دەیدا بە بووک، ئەجار تارا لە سەر ڕووی لادا ☰ رونمای عروس

**سەرمەشقانێ** / sermeşqanê/: ☜ سەرمەشقانە

**سەرمەشکانە** / sermeşkane/: ☜ سەرمەشقانە

**سەرمەقلات** / sermeq(i)lat/: ☜ سەرمەقولات

**سەرمەقولات** / sermequlat/: ناو. سەرماقۆتانی؛ سەرموقولات؛ سەرموقولات؛ سەرمەقلات؛ سەرموقولانج؛ سەرمەقولتان: ١. تەقلە ٢. /کنایە/ نوێژ ‹ئیخلاسە ئەسلی مەقسەد و خۆڕا شەقی دەبێ/ وا تێ‌دەگا بە سەرمەقوولاتە سەعادەتی! «حاجی قادر»› ☰ ١. پُشتک ٢. نماز

**سەرمەقولانج** / sermequlanc/: ناو. پالەقۆچە؛ قلۆپانی؛ سەرمەقولات ☰ مُعلّق

**سەرمەقولتان** / sermequltan/: ☜ سەرمەقولات

**سەرمەڵا** / sermeła/: ناو. ١. بەڕێوەبەری گاڵتە و گەمە ٢. کەلا؛ هەڵماتەگەورەی کایە ☰ ١. ادارەکنندەی بازی ٢. تیلەی بزرگ در بازی

**سەرمەنجەڵانە** / sermencełane/: ناو. ئەو پارەیەی زاوا کاتی ئامادە بوونی چێشت، بە ئاشپەزی دەدا ☰ انعام داماد به آشپز

**سەرمەند** / sermend/: ☜ سەرسام[٢]

**سەرمی** / sermî/: ☜ سرپ

**سەرمیان** / serm(i)yan/: ☜ سەرمایە

**سەرمێکوتە** / sermêkute/: ناو. ١. جانەوەرێکی پچووکی سەرخڕە لە زەلکاوان دەژی ٢. کەچکەقوڵەی بۆق ☰ ١. حشرەای مُرداب زی ٢. نوزاد قورباغه

**سەرمێوژە** / sermêwje/: ناو. جۆرێ ماری بۆرەڵووکەی باریکە ☰ نوعی مار

**سەرنا** / serna/: ☜ سەرنگا

**سەرناز** / sernaz/: ناو. خومام؛ لەشپۆش؛ هەر پارچەیەک کە لە کاتی خەو یان ڕاکشان، بە خۆیدا دەدەن ☰ روانداز

**سەرناس** / sernas/: ئاوەڵناو. بە دەنگ‌وئاواز؛ ناسراو و بەڕێز لە ناو خەڵکا ☰ سرشناس

**سەرنامە** / sernane/: ناو. ١. دەسپێکی نووسین ‹سەرنامەیێ نامە نامێ ئەللا/ بێ نامێ تە ناتەمامە وەڵلا «خانی»› ٢. پێناسە ☰ ١. شروع نامە ٢. شناسنامه

**سەرناو** / sernaw/: ناو. لەقەم؛ ئاوەڵناوێک بۆ ڕێزنان، تیز و تیتاڵی یان پێناسە کردنی کەسێ لە جێ یان بە شوێن ناوەکەیدا (وەک: «ئاوارە» لە «مەلا حەسەن ئاوارە»دا) ☰ لقب

**سەرناوکانە** / sernawkane/: ناو. پاداشی مامان کە ناوکی ساوا دەبڕێ ☰ انعام ماما برای بُریدن ناف نوزاد

**سەرنج** / serinc/: ناو. سرنج؛ سەرنجە؛ سێرە: ١. لاوە؛ ئاوڕ؛ کنە؛ کاری ڕوو تێ‌کردن و هۆش و گۆش دان بە کەس یان شوێنێک ‹سەرنج بدە قسەکانم!› ٢. چاوەدێری؛ ئاگاداری؛ پارێزگاریەتی؛ کار و ڕەوتی پێ‌ڕاگەیشتن ‹منداڵ پێویستی بە سەرنجێکی تایبەت هەیە› ٣. ڕەوتی ڕامان؛ وردەوە بوون ‹سەرنجم ڕاهاتووی زیوی زەڕکەفتە/ بە زەردی سەر بەفری ئێوارەوەختە «گۆران»› ☰ ١و٢. توجّه ٣. تأمُّل

▣ **سەرنج دان**: لێ وردەوە بوون ‹باش سەرنجم دا زانیم ئەو کەسەیە وا سەری‌شەو هاتە دیوەخان و زوو گەڕاوە «سوارە»› ☰ توجّه کردن

**سەرنج ڕاکێشان**: هەست بەرەو خۆ بردن ☰ جلب توجّه کردن

**سەرنجدەر** / serincder/: ناو. وردەکار و بیرکەرەوە ☰ پژوهنده

**سەرنجڕاکێش** / serincřakêş/: ئاوەڵناو. شیاوی لێ

وردبوونەوە و هۆش پێ دان (ژیانی ناو فەقێیان بە ڕاستی سەرنجڕاکێشە «هەژار، چێشتی مجێور») ≌ جالب توجّه

**سەرنجڕاکێشی** / serincřakêşî/: ناو. نموود؛ ڕاکەشی؛ بەرچاوی ≌ نمود

**سەرنجە** / serince/: ناو. ١. ☜ سەرنج ٢. سەربەرەژێر؛ سەرەولێژایی ≌ ١. ☜ سەرنج ٢. سراشیبی

**سەرنخون** / sern(i)xûn/: ناوەڵناو. سەرنگووم؛ سەرنوخوون؛ سەرنەخوون؛ سەرنەخووین؛ سەرەونخوون؛ سەرەونگووم؛ سەرەونگوون؛ ژێر و ژوور؛ قلّپ؛ بە دۆخێکی پێچەوانە و ڕوو لە خوار ≌ سرنگون

**سەرنزم** / sernizm/: ☜ سەرنەوی

**سەرنسوڤ** / sern(i)suv/: ☜ سەرنشێو

**سەرنشیڤ** / sern(i)şîv/: ☜ سەرنشێو

**سەرنشێڤی** / sern(i)şêvî/: ☜ سەرنشێو

**سەرنشێو** / sern(i)şêw/: ناو. سەرنسوڤ؛ سەربەرەژێر؛ سەرەوخوارکە؛ سەرەوخوارکایی؛ سەرەوچێر؛ سەرنشیڤ؛ لێژی؛ لێژایی؛ سەرەولێژی؛ سەرەولێژایی؛ سەرنشێوی؛ سەرنشێڤی؛ سەربەرەژێری؛ سەرەوچێری؛ سەربەرەولێژایی؛ بەرەوخوارە؛ سەرەوخوارە؛ سەرەوخوارکێ؛ کوورِ؛ سەرالیجی؛ خەزگ؛ خەشیقولک؛ شێوی؛ بوار بە باری بەرەوخوارەوە ≌ سراشیبی

**سەرنشێوی** / sern(i)şêwî/: ☜ سەرنشێو

**سەرنڤویس** / sernivwîs/: ناو. سەرنڤیشت؛ چارەنووس ≌ سرنوشت

**سەرنڤوس** / sern(i)vûs/: ناو. چارەنووس ≌ سرنوشت

**سەرنڤیسار** / sern(i)vîsar/: ناو. سەرەک نووسەر ≌ رئیس هیات تحریریه

**سەرنڤیسەر** / sern(i)vîser/: ☜ سەرنوسەر.

**سەرنڤیسی** / sern(i)vîsî/: ناو. ١. سەرژماری خەڵکی وڵات ٢. کاری نووسینی وتاری سەرەکی ≌ ١. سرشُماری ٢. سرمقالەنویسی

**سەرنڤیسیار** / sern(i)vîsyar/: ناو. سەرپەرەستی نڤیسیاران ≌ سرویراستار

**سەرنڤیشت** / sern(i)vîşt/: ☜ سەرنڤویس

**سەرنقوت** / sern(i)qot/: ناوەڵناو. ١. سەرەونخوون ٢. نغرۆ؛ قومبوو ≌ ١. واژگون ٢. غرق‌شده

**سەرنگا** / seringa/: ناو. سرنگا؛ سەرنا؛ سەرەنگا؛ سەرەنگیا؛ سەرین؛ سەرینا؛ سەرینگا؛ سەنگا؛ سەنگیا؛ سەنیا؛ سەنیر ≌ بالش

**سەرنگوم** / sern(i)gûm/: ☜ سەرنخون

**سەرنوچک** / sernuçik/: ☜ سەرنوچك

**سەرنوخون** / sernuxûn/: ☜ سەرنخون

**سەرنۆکەر** / sernoker/: ناو. نۆکەرباب؛ بابنۆکەر ≌ بزرگ نوکر

**سەرنۆگە** / sernoge/: ناو. ڕەئیسی دارۆغە ≌ سرداروغه

**سەرنوس** / sernûs/: ناو. سەرژمێر. هەروەها: **سەرنووسی** ≌ آمارگر

**سەرنوسەر** / sernûser/: ناو. سەرنڤیسار؛ سەرنڤیسەر؛ سەرپەرشتی نووسەرانی گۆڤار یان کۆمەڵەوتارێ کە کاری کۆ کردنەوە، ڕێکوپێک کردن یان چاودێری لە ئەستۆدایە ≌ سردبیر

**سەرنوچک** / sernûçik/: ناو. سەرنوچک؛ نووک؛ نیچک ≌ نُک

**سەرنەخت** / sernext/: ناو. سەرقەڵەن؛ هەرچی زیاد لە شیربایی بۆ بە شوو دان بدرێ ≌ اضافه بر شیربها

**سەرنەخون** / sernexûn/: ☜ سەرنخون

**سەرنەخونک** / sernexûnik/: ناو. گوڵەشلێرە؛ هەڵاڵەبرمە ≌ لالەی سرنگون

**سەرنەخووین** / sernexûyn/: ☜ **سەرنخون**

**سەرنەرم** / sernerm/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* گوێڕایەڵ و ڕۆحسووک ‹کوڕێکی سەرنەرمە، چۆنت پێ خۆش بێ، وا کار دەکا›. بەرانبەر: **سەرڕەق** ☰ حرف‌شنو

**سەرنەمە** / serneme/: ☜ **سەرنەوی**

**سەرنەوق** / sernewiq/: ئاوەڵناو. *[پەلار]* ۱. جـنگن؛ شەڕانی ۲. ڕووهەڵماڵاو؛ بێشەرم و شوورەیی ☰ ۱. ستیزه‌جو ۲. بی‌شرم و حیا

**سەرنەوەر** / sernewer/: ☜ **سەرنەوی**

**سەرنەوی** / sernewî/: ئاوەڵناو. سەرنزم؛ سـەرنەمە؛ سەرنەوەر؛ سەرشۆڕ ‹کوردەکان چیـدی سـەرنەوی نابن/ هەر ئەوەند نەختێ بۆ خۆ ئازا بن «خاڵـەمین»› ☰ سرافکنده

**سەرنیا** / sern(i)ya/: ناو. کاری دەمەزەرد کـردنی گاوەسن ☰ مرمت گاوآهن

**سەرنێ** / sernê/: ناو. سەردۆڵ ☰ جـای ریـزش آب در ناو آسیا

**سەرنێزە** / sernêze/: نـاو. سـەرەنێزە؛ سـەرەڕم؛ کورتە نێزەیێ کە دەکرێتـە سـەری چەکـەوە ☰ سرنیزه

**سەرو** / serw/: ☜ **سەوڵ ـ۲**

**سەروا** / serwa/: نـاو. پاشـڵ؛ پاشـۆڵ؛ پاشـبەند؛ بەشاوەند؛ بەشاڤەند؛ قافیە؛ وشەگەلێ بە بڕگە یان بڕگەگەلێکی هاوبەش، لە کۆتایی هـەر دوو باڵـی یەک بەیت یان کۆتایی بەیتەکانی هەڵبەستێکدا، بـە مـەرجێ کـە مانایـەکی سـەربەخۆیان نـەبێ (وەک: «ـێوان» لـە بـەیتی «لـە دوگمـەی سـوخمە دوێنـێ نـوێژی شـێوان/ بـەیانی دا سـپیدەی بـاغی سێوان» کە بڕگەگەلی «ـێوان» لـە هـەردووک باڵـدا هاوبەشن) ☰ قافیه

**سەروار** / serwar/: ☜ **سەربار**[1]

**سەرواز**[1] / serwaz/: ☜ **سەرباز**

**سەرواز**[2]: ئاوەڵناو. سـەرئاوەڵا؛ سـەرکراوە ☰ سـرباز؛ روباز

**سەروازبگیر** / serwazb(i)gîr/: ☜ **سەربازگیری**

**سەروازخانە** / serwazxane/: ☜ **سپاخانە**

**سەروازگیری** / serwazgîrî/: ☜ **سەربازگیری**

**سەروازە** / serwaze/: ناو. حاڵەتی لێوڕێژ بوون ‹جە شووم پڕ شووم ئەڵحەد سەرای خەم/ جە سـەروازەی هـوون جـۆی سـەرچەمەی چـەم «مەولـەوی»› ☰ سرریز

**سەروازی** / serwazî/: ☜ **سەربازی**

**سەروانک** / serwanik/: ☜ **سەرانگوێلك**

**سەروبن** / ser û bin/: نـاو. ۱. ژێـر و ژوور؛ بـان و خـوار ‹تووتنەکـەمان هـەر چەنـد نیـو گـەزێک لـە سەروبنییەوە ڕزیوە، بۆتە زێـڕی بـێ غـەوش «هـەژار، چێشتی مجێـور»› ۲. لەم سەر تا ئەو سەر؛ سەر تا خوار ‹بەزم بەزمی من و هـێمن بـوو کـە سـەروبنی قسەمان سلاوەت لە دیداری ستالین و دوعای بـەخێر بـۆ سـەرکەوتنی ڕووسـان بـوو «هـەژار، چێشـتی مجێور»› ۳. نەخۆشی منالان کە سەری مانـگ و بنی مانگ دەیگرن ☰ ۱. سر و ته ۲. اول و آخـر ۳. نوعی بیماری کودکان کـه شـروع و پایـان مـاه عـود می‌کند

**سەروبەچک** / ser û beçik/: ☜ **سەروگوێلاك**

**سەروبەر**[1] / ser û ber/: نـاو. سازی؛ ئاسوودەیی لـە ژیاندا ☰ سروسامان

**سەروبەر**[2]: ئاوەڵکار. بەتەواوی؛ تەواو ☰ تام و تمام

**سەروبەند** / ser û bend/: نـاو. چـاخ؛ دەم؛ تـاف ‹سەروبەندی جوانی و جاهێلی› ☰ اوان؛ عنفوان

⊡ **سەروبەند بەستن:** سەروبەند گـرتن؛ کـار تـەواو کردن؛ پێگەیاندن؛ ئامادە کردن ☰ آماده کردن

**سەروبەند گرتن:** ☜ **سەروبەند بەستن**

**سەروپا** / ser û pa/: نـاو. سـەروپێ؛ سـەروپاچک؛ پەل و سەری حەیوان بە بڕدراوی ☰ کله‌پاچه

**سەروپاچک** / ser û paçik/: ☜ **سەروپا**

**سەروپاچکە / ser û paçke/**: ئاوەڵناو. گەورەوگچکە؛ ورد و تەمەن نزیک یەک ‹چەن منداڵی سەروپاچکەی هەیە› ☰ قدونیمقد

**سەروپۆتراک / ser û potrak/**: ناو. سەروپۆتلاک؛ سەروپۆتراک؛ سەروپەچک؛ سەروپۆتەلاک؛ سەروپۆرتک: ١. سەروگوێلاک؛ سەرترین بەشی جەستە ٢. دیمەنی سەرپێچ و مێزەر ☰ ١. سر و سیما ٢. منظر دستار و عمامە

**سەروپۆتراک / ser û potřak/**: ☜ سەروپۆتراک

**سەروپۆتک / ser û potik/**: ☜ سەروگوێلاک

**سەروپۆتڵاک / ser û potłak/**: ☜ سەروپۆتراک

**سەروپۆتەلاک / ser û potełak/**: ☜ سەروپۆتراک

**سەروپۆرت / ser û port/**: ناو. بۆ هەر کەسێ کەمێک ☰ بە هرکسی اندکی

**سەروپۆرتک / ser û portik/**: ☜ سەروپۆتراک

**سەروپەچک / ser û peçik/**: ☜ سەروپۆتراک

**سەروپێ / ser û pê/**: ☜ سەروپا

**سەروپێچ / ser û pêç/**: ناو. مێزەر؛ مێزەرە؛ مشکی؛ سەروێن؛ سەرپێچ؛ پێچومێزەر؛ سەر و شەدە؛ سەر و مێزەر؛ جامانە؛ جەمەدانی؛ جامەدانی؛ ئاغەبانوو؛ ئاغابانوو؛ ڕەشتی؛ کەفینک؛ یالخ؛ یەشماخ؛ یاشماخ؛ شاشک؛ شاشیک؛ شەشک؛ پارچەیەک کە پیاوان بە سەرییەوە دەبەستن و جۆراوجۆری هەیە ☰ دستار

**سەروپێچدار / ser û pêçdar/**: ئاوەڵناو. مێزەربەسەر؛ مێزەرەوەسەر ☰ عمامە بە سر

**سەروپێچکە / ser û pêçke/**: ناو. مەلۆتکە؛ منداڵی ساوا ‹گوتی: من ماڵوێرانی بوومەلەرزەم، دوو منالم هەن سەروپێچکە «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ نوباوە

**سەروتار / serw(i)tar/**: ناو. وتاری سەرەکی گۆڤار و بلاڤۆک ☰ سرمقالە

**سەروترە / serwitre/**: ☜ سەرفیترە

**سەروچاو / ser û çaw/**: ناو. سەروڕوو؛ دەم و چاو؛ ڕوو؛ ڕوخسار ☰ سر و صورت

**سەروچاوە / ser û çawe/**: ☜ سەرچاوە

**سەروچاوێ / ser û çawê/**: ☜ سەرچاوە

**سەروخوار / ser û x(i)war/**: ناو. هەر دوو ئالی بان و خوار ☰ بالا و پایین

**سەرودەر / ser û der/**: ناو. سەرودەروو؛ سەروەدەر؛ چۆنیەتی زانین؛ تێگەیشتن ‹دانیشتووی سەر ماڵم و سەییاحی سەفەر نیم/ چی بکەم وەکوو یارانی ترم بێسەرودەر نیم «قانع»› ☰ درک؛ فهم

▣ **سەرودەر کردن**: ڕێ دەرکردن؛ ڕێ دۆزینەوە ☰ راە درکردن

**سەرودەروو / ser û derû/**: ☜ سەرودەر

**سەروڕوو / ser û řû/**: ☜ سەروچاو

**سەروڕیش / ser û řîş/**: ناو. ١. ڕیش ٢. ڕیش و سمێڵ ☰ ١. ریش ٢. ریش و سبیل

**سەروزمان / ser û z(i)man/**: ناو. سەروزوو؛ سەروزوان: ١. هێزی جووڵان و قسە کردن؛ تابشتی زۆر کەم ‹بێ سەروزمان کەوتووە› ٢. لفتوگفت؛ دەراوی دەم ‹سەروزمان شیرین› ☰ ١. نا ٢. قدرت ناطقە

**سەروزماندار / ser û z(i)mandar/**: ئاوەڵناو. سەروزواندار؛ بە دەموزمان؛ دەموپلدار؛ بە توانا لە قسە کردندا ‹کابرایەکی سەروزماندار بوو› ☰ زبانآور

**سەروزوان / ser û z(i)wan/**: ☜ سەروزمان

**سەروزوانخۆش / ser û z(i)wanxoş/**: ئاوەڵناو. خاوەن قسە و کردەوەی پەسند لەبەردڵان ☰ خوشاخلاق

**سەروزواندار / ser û z(i)wandar/**: ☜ سەروزماندار

**سەروزوو / ser û zû/**: ☜ سەروزمان

**سەروزیاد / ser û z(i)yad/**: ئاوەڵناو. سەروەزیاد؛

سەربەزیا؛ بەشی تەواو، بێ کەمایەسی ‹چێشتەکە بەشی کرد و سەروزیادیش بوو› ☰ کافی و وافی

⊡ **سەروزیاد بوون**: بێ کەم و کووڕی بوون ☰ کافی بودن

**سەروژێر**[1] / ser û jêr/: ناو. ١. سەروخوار ٢. پێڵاوی پینە لێ دراوی سەرتازە ٣. دوو لە بزاوەکانی سەر پیتی نووسراوە ☰ ١. بالایی و پایینی ٢. کفش پینەزده ٣. زیر و زبَر اِعراب

**سەروژێر**[2]: ئاوەڵناو. ١. ژێروژوور؛ کاول؛ وێران ٢. سەرنخوون ٣. بە دوو نهۆمەوە ‹ماڵێکی سەروژێرم سەند› ☰ ١. ویران ٢. نگون ٣. دوطبقه

**سەروساخت** / ser û saxt/: ناو. ساختوپاخت؛ کەینوبەین ☰ تبانی

**سەروسامان** / ser û saman/: ناو. ١. ڕێکوپێکی؛ سەقام ٢. ماڵوسامان؛ ماڵ و دارایی ☰ ١. سروسامان ٢. ثروت و سامان

⊡ **سەروسامان دان**: ١. ڕێکوپێک کردن ‹ژنێ بخوازە و سەروسامانێ بدە بە ژیانت!›. هەروەها: **سەروسامان گرتن** ٢. سەروماڵ بەخت کردن/ دۆڕان ‹شەبەهی زولفی شەبەهە گۆنەیە، ڕووگەردانی/ بە سەری ئەو کە بە سەودا سەروسامانم دا «نالی»› ☰ ١. سروسامان دادن ٢. از هستی ساقط شدن

**سەروسەکوت** / ser û sekut/: ناو. سەروسیما؛ سەروقلخ؛ بیچم؛ تەرح و دیدار ☰ سروسیما

**سەروسەنەمە** / ser û seneme/: ناو. پێوقەدەم ‹ئەم ئاغایە سەروسەنەمەی باش نەبوو› ☰ یُمن

**سەروسیما** / ser û sîma/: ☜ **سەروسەکوت**

**سەروشک** / serwişk/: ئاوەڵناو. [پەلار] سەرهشک؛ سەرهوویشک؛ سەرهیشک: ١. سەربەتاڵ؛ زەینکوێر؛ نازیرەک ٢. سەرڕەق؛ سەرسەخت ٣. نافەرمان؛ ڕانەهێنراو ☰ ١. کودن ٢. سرسخت ٣. رام‌نشده

**سەروشوێن** / ser û ş(i)wên/: ناو. شوێنەوار؛ ئاسەوار ‹هەر بڕۆم نابەڵەد و بێسەروشوێن/ دیار نییە خێڵی هەڵۆیان لە کوێن «سوارە»› ☰ ردّ؛ اثر

**سەروشەدە** / ser û şede/: ☜ **سەروپێچ**

**سەروعوزرشۆر** / ser û 'uz(i)rşor/: ئاوەڵناو. [کینایە] بالغ؛ پێگەیشتوو (کچ) ☰ بالغ (برای دختر)

**سەروقلخ** / ser û qilx/: ☜ **سەروسەکوت**

**سەروقنگ**[1] / ser û qing/: ناو. سەروبن؛ هەردووسەر ‹سەروقنگی کیسەکەیان بەست و بردیان› ☰ سروته

**سەروقنگ**[2] / ser û qing/: ☜ **سەروقوون**

**سەروقوون**[1] / ser û qûn/: ئاوەڵناو. [شووورەیی] سەروقنگ؛ پێچەوانە ‹ئەو تاپلۆیە سەروقوونە!› ☰ وارونە

**سەروقوون**[2]: ئاوەڵکار. [شووورەیی] سەروقنگ؛ پێچەوانە ‹تاپلۆکەی سەروقوون داکوتا!› ☰ برعکس

**سەروکار** / ser û kar/: ناو. پەیوەندی؛ ئاشنایەتی ☰ سروکار

**سەروکانی** / ser û kanî/: ناو. سەرکانی؛ سەرچاوە ☰ سرچشمە

**سەروکەللە** / ser û kelle/: ☜ **سەروگوێلاک**

**سەروکەلە** / ser û kele/: ☜ **سەروگوێلاک**

**سەروگوێ** / ser û g(i)wê/: ناو. لک و چوکلی دار ☰ شاخ و برگ درخت

⊡ **سەروگوێ کردن**: هەڵپەرتاوتن؛ پەرتاوتن؛ قەیچی کردنی دار ☰ هرس کردن؛ پیراستن درخت

**سەروگوێلاک** / ser û g(i)wêlak/: ناو. سەروکەللە؛ سەروکەلە؛ سەروپۆتراک؛ سەروپۆتک؛ سەروبەچک؛ سەرترین بەشی جەستە، لە گوێ بەرەوژوور ☰ سروکلە

**سەرولێژە** / ser û lêje/: ☜ **سەرەولێژی**

**سەروماڵ** / ser û mał/: ناو. هەرچی هەیە و خۆشەویستە ‹سەر دانی لە ڕێی عەشق ڕەزا، لازمە

عاشق/ بۆ یار سەرومال سپەری تیری قەزا کا «شێخ ڕەزا»› 🇮🇷 جان و مال

**سەرومڕ / ser û miř/**: ئاوەڵکار. تەواو؛ بێ کەم و زیاد؛ سەر و زیاد 🇮🇷 کافی؛ بدون کم و کاست

**سەرومیت / ser û mît/**: ناو. وشەیەکە لە کایەی کەلایێندا 🇮🇷 اصطلاحی در تیلەبازی

**سەرومێزەر / ser û mêzer/**: ☜ سەروپێچ

**سەروناو / ser û naw/**: ناو. وشەیەکە لە یاری سنجۆقێندا 🇮🇷 اصطلاحی در بازی

**سەرووەختێ / ser û wextê/**: ئاوەڵکار. دەمێک؛ دەمەک 🇮🇷 مدتی

**سەروە[1] / serwe/**: ناو. دولکە؛ سەردولکە؛ کاری بە مردوودا هەڵگوتن 🇮🇷 نوحه

**سەروە[2]**: ئاوەڵناو. سەروو؛ ژووروو؛ سەرین 🇮🇷 بالا

**سەروە[3]**: ئامراز. سەر بە؛ هاوگەڕی ‹ئێمە سەروە عەشرەتی جافین› 🇮🇷 منسوب به

**سەروەدەر / serweder/**: ☜ سەرودەر

▣ **سەروەدەر کردن**: دۆزینەوە و پێ زانین ‹ئادرەسەکەیان سەروەدەر ناکەین› 🇮🇷 دریافتن؛ پیدا کردن

**سەروەر / serwer/**: ئاوەڵناو. سەرگەورە؛ سەردار؛ سالار 🇮🇷 سرور

**سەروەری / serwerî/**: ناو. پایەبەرزی؛ سەرداری 🇮🇷 سروری

**سەروەزیاد / serwez(i)yad/**: ☜ سەروزیاد

**سەروەستا / serwesta/**: ناو. سەرۆکی وەستاکاران 🇮🇷 رییس اُستادکاران

**سەروەسەر / serweser/**: ☜ سەربەسەر

**سەروەسەرە / serwesere/**: ☜ سەربەسەرە

**سەروەسەرێ / serweserê/**: ☜ سەربەسەرە

**سەروەسیەت / serwes(i)yet/**: ناو. سەروەگرد؛ کەسێ کە پاش مردوو بە سەر ماڵ و منداڵی ڕادەگا 🇮🇷 وصی؛ قیم

**سەروەش / serweş/**: ئاوەڵناو. سەرخۆش؛ مەست 🇮🇷 سرخوش

**سەروەشین / serweşîn/**: ☜ سەروەشێن[1]ـ١

**سەروەشێن[1] / serweşên/**: ناو. ١. سەروەشین؛ تاڤگە؛ سووڵاف؛ ئاوهەڵدێر ٢. یەکەم بەرهەمی کونجی 🇮🇷 ١. آبشار ٢. اولین محصول کُنجد

**سەروەشێن[2]**: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی شاخدارێ کە بە شاخ دە خەڵک هەڵدەدا 🇮🇷 شاخزن

**سەروەگرد / serwegird/**: ☜ سەروەسیەت

**سەروەن / serwen/**: ناو. سەروێن؛ دەسرەی سەر ‹وە سەرگەردی وم وە سەروەنەوە/ وەک کەڵ ئەڕوانێ وە دەروەنەوە «فولکلۆر»› 🇮🇷 دستار

**سەروەهار / serw(i)har/**: ئاوەڵناو. سەرشۆڕ؛ سەرنزم 🇮🇷 شرمسار

**سەروین / serwîn/**: ناو. سەروێن؛ دەسرەی سەر ‹بە کەچی سەروین هەزارڕەنەوە/ بە شێوەی شیرین شۆخوشەنگەوە «ئەمجەد بەگی کۆماسی»› 🇮🇷 دستار

**سەروێ / serwê/**: ئاوەڵناو. هێمن؛ لەسەرخۆ 🇮🇷 آرام

**سەروێن / serwên/**: ناو. سەروەن؛ سەروین؛ دەسرەی سەر 🇮🇷 دستار

**سەرۆ[1] / sero/**: ناو. ١. ☜ سەوڵ ـ٢ ٢. دەنگەژە؛ بیر و هەستێک کە لە نادیارەوە بە دڵ دەگا 🇮🇷 ١. ☜ سەوڵ ـ٢ ٢. الهام

**سەرۆ[2]**: ئاوەڵکار. لە لای ژوور؛ لە ژوورەوە ‹سەرۆ داینە با دەسی نەگاتێ!› 🇮🇷 بالا

**سەرۆک / serok/**: ناو. ١. سەردار؛ سەرگەورە؛ پێشەوا؛ ڕەئیس ٢. سەراک؛ کولکەی شانەکراو ٣. شتێ کە مەلەوان لە سەر سەری دایدەنێ بۆ پەڕاندنەوە ٤. دۆکی ڕۆنی داغ کراو 🇮🇷 ١. رئیس؛ رهبر ٢. پشم و موی شانەزدە و پاک شدە ٣. چیزی کە شناگر برای عبور دادن بر سر گذارد ۴. کف روغن داغ شدە

**سەرۆکایەتی / serokayetî/**: ناو. سەرۆکی؛

ڕەئیسی: ۱. پیشە یان پلەی سەرۆک ‹سەرۆکایەتی زانستگا› ۲. بار یان چۆناوچۆنی سەرۆک بوون ‹لە سەرۆکایەتی تەنیا فیزەکەی هەیە و بەس!› ☰ ۱و۲. ریاست

**سەرۆککۆمار** / serokkomar/: ناو. سەرکۆمار؛ هەڵبژاردراوی خەڵک بۆ سەرۆکی وڵات ☰ رییس جمهور

**سەرۆکوەزیران** / serokwezîran/: ناو. سەرەکوەزیران؛ سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران ☰ نخست‌وزیر

**سەرۆکهۆز** / serokhoz/: ناو. کەلانتەر؛ سەرەکهۆز ☰ رئیس ایل

**سەرۆکی** / serokî/: ☜ **سەرۆکایەتی**

**سەروو**[۱] / serû/: ناو. سەرڤە؛ ژوورگ؛ لای ژووروو ‹سەرووی مالمان باخێکی خۆشە› ☰ طرف بالا

**سەروو**[۲]: ئاوەڵناو. سەرڤە؛ ژوورین؛ سەرگین ‹کۆلانی سەروو› ☰ بالایی

**سەرووتر** / serûtir/: ئاوەڵناو. بانتر؛ بڵندتر ☰ بالاتر

**سەرووک** / serûk/: ناو. دەسماڵی سەری ژنان ☰ روسری

**سەروویی** / serûyî/: ئاوەڵناو. لسەر؛ بانگین ☰ بالایی

**سەرە**[۱] / sere/: ناو. ۱. گوێزی دەسکەڵلا ۲. نۆبە؛ باو؛ هەل ۳. ☜ **سەرەمریشک** ٤. گارەشی سەرچۆپی لە گێرەدا. ‹بنەی خۆی ناکا و لە سەرەی خەڵک خێرایە! «مەسەل»› بەرانبەر: **بنە** ٥. پووشانە؛ سەرانەی ئاژەڵی ڕەعیەت ٦. *[ڕێزمان]* دەنگی بەرانبەری ژێرە ۷. سەر؛ دەرکی کەلوپەل ☰ ۱. گردویی کە بە جای تیلە باشد ۲. نوبت ۳. ☜ **سەرەمریشک** ۴. حیوان سردستە در خرمنکوبی ۵. باج مالکانە از حیوانات رعیت ۶. فتحە ۷. سرپوش

⊡ **خستنە سەرەدا:** هەڵنەهاوردن؛ نەبوونە جووچکی یەک یان چەند هێلکەی پەلەوەر ‹کەوەکە دانەیەک لە هێلکەکانی هەڵنەهاوردگە، خستییە سەرەدا› ☰ جوجە نیاوردن تخم پرندە

**سەرە**[۲]: ئاوەڵناو. کەیوانوو؛ کابان؛ بەتوانا و لێزان لە ماڵداریدا ☰ کدبانو

**سەرە**[۳]: پێشوشە. ۱. تەواو؛ پێگەیشتوو (حەیوان) ‹سەرەمریشک؛ سەرەمەڕ› ۲. هەڵکەوتوو ‹سەرەژن› ۳. تەواو؛ کامڵ ‹سەرەمێر› ☰ ۱. کامل؛ بالغ (حیوان) ۲. سالار ۳. تمام؛ کامل

**سەرەبزۆت** / sereb(i)zot/: ☜ **سەرەبزووت**

**سەرەبزووت** / sereb(i)zût/: ناو. بزووت؛ بزۆت؛ بسۆت ☰ نیمسوز

**سەرەبەهار** / serebehar/: ناو. ڕۆژانی سەرەتای بەهار ‹سەرەبەهاران هەموو ڕۆژێ دەچوومە تۆپێن «هێمن»› ☰ نوبهار

**سەرەپیرێژن** / serepîrêjin/: ناو. *[کینایە]* کچی چکۆلەی زۆرزان ☰ دختر کوچک دانا

**سەرەت** / seret/: ☜ **سەرەند**

**سەرەتا** / sereta/: ناو. سەرپێلک: ۱. دەسپێک ۲. ئێکم سەری دەزوو ۳. دەسپێک؛ پێش وتار ☰ ۱. آغاز؛ شروع ۲. سرنخ ۳. پیشگفتار

**سەرەتاتکێ** / seretatkê/: ناو. سەردیقانێ؛ سەرەدیقانێ؛ کاری سەر کێشان؛ سەر قوتان؛ ڕوانین بە دزییەوە ☰ سَرَک

**سەرەتان** / seretan/: ناو. ۱. شێرپەنجە؛ کانسیر ۲. تەختەی قالی تەون پێوە بەستن ☰ ۱. سرطان ۲. تاربند قالیبافی

**سەرەتایی** / seretayî/: ئاوەڵناو. بەرایی؛ پێشوونەی هەر شتێ ☰ مقدماتی

**سەرەتەشی** / sereteşî/: ناو. ۱. دارێکی خڕی کونە لە کن نووکە تەشییەوە ۲. زەلەقوون؛ دومدیکە؛ پووش‌بەقوونە ☰ ۱. کلەدوک نخ ریسی ۲. سنجاقک

**سەرەتیر** / seretîr/: ناو. نووکی سێ سووچ و تیژی تیر ☰ ناوک؛ سرِ پیکان

**سەرەجە** / serece/: ناو. ١. نەخۆشییەکی وڵاخە کە سەر و لەشی دەماسێ ٢. تاوت؛ دارمەیت 🇮🇷 ١. نوعی بیماری دام و ستور ٢. تابوت

**سەرەچەرم** / sereçerm/: ناو. ١. چەرمی سەری ڕەشەماڵ ٢. *[کینایە]* زەرەر و زیان 🇮🇷 ١. چرم سر دام ٢. زیان

◻ **سەرەچەرم دان:** *[کینایە]* زەرەر دان؛ زیان ویکەوتن 🇮🇷 زیان کردن

**سەرەخولێ** / serexulê/: ناو. ١. سەرەگێژە ٢. نەخۆشی سەرسامی 🇮🇷 ١. سرگیجه ٢. بیماری سرسام

**سەرەخۆ** / serexo/: ناوەلناو. لەسەرخۆ؛ هێدی؛ بە سەبر 🇮🇷 شکیبا

**سەرەخۆرە** / serexore/: ناوەلناو. *[باوەڕی کۆن]* تایبەتمەندی منالێ کە زوو باوکی بمرێ 🇮🇷 بدقدم

**سەرەخۆشی** / serexoşî/: ناو. ١. سەرسەلامەتی؛ دڵنوایی لە خاوەن مردوو ‹سەرەخۆشی لە بنەماڵەی شەهیدان دەکەین› ٢. پرسە؛ فاتحەخوانی 🇮🇷 ١. تسلیت ٢. مجلس ترحیم

◻ **سەرەخۆشی (لێ)کردن:** دڵنەوایی کردن لە خاوەن مردوو 🇮🇷 تسلیت گفتن

**سەرەخەر**[1] / serexer/: ناو. ١. سەرناز؛ بەخۆدادەر ٢. *[باوەڕی کۆن]* سەرەکەرێ کە لە نێو بێستان هەڵیاندەواست، بۆ چاوەزار 🇮🇷 ١. رختخواب ٢. کلەی الاغ که برای رفع چشم‌زخم، در جالیز آویزان می‌کردند

**سەرەخەر**[2]: ناوەلناو. *[پلار]* ١. خوێنتاڵی کارتێکدەر ٢. بەڵای بۆگەن؛ بەڵای بەد 🇮🇷 ١. گوشت‌تلخ ٢. سرخر

**سەرەخەری** / serexerî/: ناو. ١. گەگری؛ پێچەقێنی؛ کاری پەلپ گرتن ٢. بەدودمی؛ قۆشەیی ‹نەک چۆلەکە بێ و وەک باز بێتە ڕاو/ بە سەرەخەری خۆی خاتە ناو داو «قانع»› 🇮🇷 ١. لجبازی ٢. نحسی

**سەرەد** / sered/: ☜ سەرەند

**سەرەدوگ** / seredûg/: ناو. سەرەتەشی 🇮🇷 کلەی دوک نخریسی

**سەرەدەر** / sereder/: ناو. ١. ویستە؛ دەرو؛ بوار؛ دەرەتان؛ ڕێگەی دەرباز بوون ٢. سەرودەر؛ کاری ناسین و زانین 🇮🇷 ١. مفر؛ راه نجات ٢. فهم؛ درک

**سەرەدەنگ** / seredeng/: ناو. ١. کاری گێڕانەوەی بەشێک لە گۆرانی ٢. بەستەی دوای گۆرانی درێژ 🇮🇷 ١. عمل بازگفتن مقطعی از ترانه ٢. تصنیف بعد از آواز

**سەرەدیقانێ** / seredîqanê/: ☜ سەرەتاتکێ

**سەرەڕای** / sereřay/: ئامراز. سەرڕای؛ لە سەرینەی ‹سەرەڕای پووڵی زۆریش، حەقی ئوتێل و خواردن و سەفەرم لە سەر نووسەران بوو «هەژار، چێشتی مجێور»› 🇮🇷 علاوه بر

**سەرەڕم** / sereřim/: ناو. نووکەنێزەی درێژ 🇮🇷 سرنیزەی بلند

**سەرەڕۆ** / sereřo/: ناوەلناو. ١. تایبەتمەندی بارەبەرێ کە پێش کاروان دەکەوێ و دوور دەکەوێتەوە ٢. تایبەتمەندی کەسێ کە بێ پرس و بیرکردنەوە کار دەکا. هەروەها: **سەرەڕۆیی** 🇮🇷 ١. ویژگی ستوری که از کاروان جلو افتد و دور شود ٢. بی‌تدبیر و خودسر

**سەرەڕێ** / sereřê/: ناو. سەرەڕێگە؛ بان ڕا؛ سەری ڕێکێ 🇮🇷 سر راه

◻ **سەرەڕێ بە کەسێ گرتن:** بەر بە ڕۆیشتنی کەسێک گرتن 🇮🇷 سر راه کسی را گرفتن

**سەرەڕێگە** / sereřêge/: ☜ سەرەڕێ

**سەرەزمین** / serezmîn/: ناو. وڵایەت؛ وڵات؛ سەرەزمین 🇮🇷 منطقه

**سەرەژن** / serejin/: ناو. ژنی کابان و زانا و قسەزان

🇮🇷 زن خانەدار کدخدامنش

**سەرەژوورە** / serejûre/: ناو. چـۆڕۆ؛ بڵـندایی 🇮🇷 بلندی

**سەرەژێر** / serejêr/: ناو. بەرەوخوار 🇮🇷 سرازیر

**سەرەژێرە** / serejêre/: ناو. سەربەرەوخوارە؛ سەربەرەوژێرە؛ لێژایی 🇮🇷 سرازیری

**سەرەستورکە** / seres(i)turke/: ناو. جۆرێ کرمی ناو زگ 🇮🇷 نوعی انگل شکم

**سەرەسۆدرە** / seresodre/: ناوەڵناو. سەرسۆدەرە؛ مایەفیتنە؛ ئاژاوەچی 🇮🇷 فتنەانگیز

**سەرەسوت** / seresût/: ناو. پەلەبزووت؛ دارەدەست و تێلای سەر سووتاو 🇮🇷 چوبدست سر سوخته

**سەرەسوورە** / seresûře/: ناو. سەرەسووڕێ؛ سەرەگێژە 🇮🇷 سرگیجە

**سەرەسووڕێ** / seresûřê/: ☜ سەرەسوورە

**سەرەسەبیلە** / seresebîle/: ناو. سەرێکە لە کانزای زەرد دەکرێ بۆ سەبیلی تووتن کێشان 🇮🇷 سرچُپق فلزی

**سەرەشکێنە** / sereş(i)kêne/: ☜ سەرشکێنە

**سەرەفراز** / seref(i)raz/: ☜ سەربەرز

**سەرەڤەراز** / sereveraz/: ناو. بەرەو بڵندایی؛ ئەڤرازی 🇮🇷 سربالایی

**سەرەقلیان** / sereqilyan/: ☜ سەرەقەندە ـ٢

**سەرەقوڵە** / sereqûłe/: ناو. ڕیش‌باوا؛ ڕیش‌بابا؛ هەنگوور کەڵەشێری 🇮🇷 ریش‌بابا (انگور)

**سەرەقەندە** / sereqende/: ناو. سەرەقەنگە؛ سەرەقەننە: ١. سەرەسەبیلە ٢. سەرەقلیان؛ سەری نێرەگە؛ پیاڵەیەکی کون ـ کون لە سەر قلیان بۆ ئاگر و تەماکۆ تێکردن 🇮🇷 ١. سرچُپق ٢. سرقلیان

**سەرەقەنگە** / sereqenge/: ☜ سەرەقەندە

**سەرەقەننە** / sereqenne/: ☜ سەرەقەندە

**سەرەقەیچی** / sereqeyçî/: ☜ سەرەمەقەست

**سەرەک** / serek/: ناو. ١. سەرۆک؛ پێشەوا ٢. درشتەی سەر بێژنگ ٣. داری دوو فلیقانەی درک کۆ کردنەوە ٤. دەفری لە تووڵ چنراوی جێ‌هەنگ 🇮🇷 ١. رییس؛ رهبر ٢. درشتِ سرِ غربال ٣. چوب دوشاخەی خار جمع کردن ۴. سبد مخصوص نگهداری زنبور عسل

**سەرەکخوز** / serekhoz/: ناو. سەرکانی ئێلی؛ گەورەی هۆزێ کە لە بناری کێو و چیادا دەژین 🇮🇷 بزرگ ایل

**سەرەکی** / serekî/: ناوەڵناو. ١. گرینگ؛ گرنگ ٢. بنەمایی؛ سەرەکی 🇮🇷 ١. مهم ٢. اصلی

**سەرەگاوخان** / seregawxan/: ناو. هۆگان؛ گامەرز؛ شوێنێ کوتایی هێلی جووت بوون و وەڕسووران 🇮🇷 محل دور زدن شخم

**سەرەگێجە** / seregêce/: ☜ سەرگێجە

**سەرەگێژە** / seregêje/: ☜ سەرگێجە

**سەرەماسی** / seremasî/: ناو. بای سوور؛ سوورەبا؛ نەخۆشییەکی گرانی پێستە 🇮🇷 باد سرخ

**سەرەمر** / seremir/: ☜ سەرەمریشك

**سەرەمریشک** / serem(i)rîşk/: ناو. سەرە؛ سەرەمر؛ مریشکی دوو بەهار دیتوو 🇮🇷 مرغ دوبهار دیده

**سەرەمڕ**[1] / seremiř/: ناوەڵناو. هەمیشەیی ‹لە دووی کارێکی سەرەمڕە› 🇮🇷 دایمی؛ همیشگی

**سەرەمڕ**[2]: ناوەڵکار. دایمە؛ هەمیشە ‹سەرەمڕ دێ سەرمان لێ دەدا› 🇮🇷 همیشه

**سەرەمژانە** / serem(i)jane/: ☜ سەرمژانە

**سەرەمقەست** / serem(i)qest/: ☜ سەرەمەقەست

**سەرەمەرگ** / seremerg/: ناو. دەمی ئاویلکە دان ‹ڕۆژێک نامەیەکم وەرگرت، نووسرابوو: من نەخۆشێکم؛ لە سەرەمەرگا ... «هەژار، چێشتی مجێور»› 🇮🇷 زمان نزع

**سەرەمەڕ** / seremeř/: ناو. مەڕێ کە دوو زگ زابێ 🇮🇷 گوسفند دوبار زاییده

**سەرەمەقەست** / seremeqest/: ناو. سەرەمقەست؛ سەرەقەیچی؛ دەمەقەیچی؛ بڕشتی ورد و درشتی لە جلک‌بڕین ماو ☰ سرقیچی؛ قطعه‌پارچه‌های باقیمانده از بُرش

**سەرەمێر** / seremêr/: ناو. پیاوی کامڵ و لە چل ساڵ بە باڵا ☰ مرد میانسال

**سەرەمێکوتە** / seremêkute/: ناو. کەوچکەقوڵە؛ کلکەتەشی؛ ساوای بۆق ☰ نوزاد قورباغه

**سەرەن** / seren/: ☜ **سەرەند**

⊡ **سەرەن کردن**: دەغڵ بە سەرەندا کردن بۆ پاک بوونەوەی لە پڕ و پووش ☰ سرند کردن

**سەرەناز** / serenaz/: ناو. سەرەنداز: ١. سەرناز؛ سەرپۆش؛ ئەوەی سەروملی پێ دادەپۆشن ٢. لاکێش؛ کەنارە؛ مافوورەی درێژووکە ☰ ١. سرانداز ٢. قالی کناره

**سەرەنجام** / serencam/: ☜ **سەرئەنجام**

**سەرەنجە** / serence/: ناو. ئاکام؛ بەرهەم ☰ سرانجام؛ نتیجه

**سەرەند** / serend/: ناو. سەرەد؛ سەرەن؛ سەڕەت؛ سەڕەد؛ سەڕەن؛ سەڕەند؛ سەرەت؛ کەو ☰ سَرَند

**سەرەنداز** / serendaz/: ☜ **سەرەناز**

**سەرەنگا** / serenga/: ناو. ١. ☜ **سەرنگا** ٢. لای سەروو ☰ ١. ☜ **سەرنگا** ٢. طرف بالایی

**سەرەنگرێ**[١] / sereng(i)rê/: ناو. کاری ڕەت بردن؛ هەڵەنگووتن ☰ سکندری

**سەرەنگرێ**[٢]: ئاوەڵناو. ڕەت‌بردە؛ هەڵەنگووتە ☰ سکندری خورده

**سەرەنگیا** / sereng(i)ya/: ☜ **سەرنگا**

**سەرەنناز** / serennaz/: ناو. نقینۆ؛ نقین‌پۆش؛ لحێف ☰ لحاف؛ پتو

**سەرەنوێلک** / serenwêlik/: ☜ **سەرانگوێلک**

**سەرەنیک** / serenîk/: ناو. دەسماڵی حەریر ☰ دستمال حریر

**سەرەنێزە** / serenêze/: ☜ **سەرنێزە**

**سەرەو**[١] / serew/: ئاوەڵکار. بەرەو بان؛ لای ژووروو ‹بچۆ سەرەو! خوارەو جێگە نییە›. بەرانبەر: **خوارەو** ☰ طرف بالا

**سەرەو**-[٢]: پێشوشە. بەرەو ؛ لای ژووروو ‹سەرەوخوار؛ سەرەوژوور› ☰ به طرف

**سەرەوار** / serewar/: ☜ **سەرەوخوار**

**سەرەوارە** / sereware/: ☜ **سەرەوخوار**

**سەرەوبان** / serewban/: ئاوەڵکار. بەرەژوور؛ سەربەرەوژوور؛ سەرەوبان ☰ سربالا

**سەرەوچێر** / serewçêr/: ☜ **سەرنشێو**

**سەرەوچێری** / serewçêrî/: ناو. سەرنشێو؛ سەرنسوف ☰ سراشیبی

**سەرەوخوار**[١] / serewx(i)war/: ناو. سەرەوار؛ سەرەوارە؛ سەرەوژێر؛ سەربەرەژێر ☰ سرازیر

**سەرەوخوار**[٢]: ئاوەڵناو. سەرەوار؛ سەرەوارە؛ بەراوەژوو ‹وێنەکەی سەرەوخوارە› ☰ سروته

⊡ **سەرەوخوار کردنەوە**: ١. بەرەو ژێر بردن ٢. سەرەوخوار کردن؛ نخوون کردنەوەی دەفر ☰ ١. سرازیر کردن ٢. وارونه کردن ظرف

**سەرەوخوار**[٣]: ئاوەڵکار. سەرەوار؛ سەر بەرەو خوار ‹سەرەوخوار بڕۆن!› ☰ سرازیر

**سەرەوخوارکایی** / serewx(i)warkayî/: ناو. سەرەوخوارکێ؛ سەرەوخوارکە؛ سەرنشێو؛ سەرنسوف؛ سەربەرەژێر ☰ سراشیبی

**سەرەوخوارکە** / serewx(i)warke/: ☜ **سەرەوخوارکایی**

**سەرەوخوارکێ** / serewx(i)warkê/: ☜ **سەرەوخوارکایی**

**سەرەوخوارە** / serewx(i)ware/: ناو. سەرەوخواری؛ سەرەوژێرە؛ سەربەرەژێرە ☰ سرازیری

**سەرەوخواری** / serewx(i)warî/: ☜ **سەرەوخوارە**

**سەرەوژوور**[١] / serewjûr/: ناو. سەربەرەژوور؛

بەرەوژووورە؛ سەرەوژوورایی ☰ سربالایی

**سەرەوژوور**[2]: ئاوەڵکار. سەربەرەژوور؛ بەرەوژوورە ‹سەرەوژوور کەوتنە ڕێ› ☰ به طرف بالا

**سەرەوژوورایی** / serewjûrayî/: ☜ سەربەرەژوور

**سەرەوژێر** / serewjêr/: ☜ سەرەوخوار[1]

**سەرەوژێرە** / serewjêre/: ☜ سەرەوخوارە

**سەرەوژێری** / serewjêrî/: ناو. خەشیقولک؛ خلیسک؛ سەرەولێژایی ☰ سراشیبی

**سەرەوقوڵە** / serewqułe/: ناو. نووکووسۆ؛ یارییەکی کچانەیە بە دەرزیلە دەکرێ ☰ از بازی‌های دخترانه

**سەرەوقوم** / serewqum/: ئاوەڵناو. سەرەوخوار بوو لە ناو گۆمدا ☰ واژگون در آب

**سەرەوکار** / serewkar/: ☜ سەرکار

**سەرەوکۆ** / serewko/: ناو. بەرەوژوورە؛ سەرەوژوورایی ‹مانیای مەینەت سەرەوکۆی ستەم/ مەعدوومی بەر کۆی سەرەوچێرەی خەم «مەولەوی»› ☰ سربالایی

**سەرەوگرد** / serewgird/: ناو. کەسێ کە پاش مردوو بە سەر ماڵ و منالی ڕادەگا ☰ وصی؛ قیم

**سەرەولێژ** / serewlêj/: ئاوەڵناو. سەرەوژێر ‹ئیش کە ڕووی ئێستە لە هەورازە، سەرەولێژی نەکەی!/ فکری وردیشی ئەوێ، هەر بە دوعا و نوێژی نەکەی! «شوکری فەزلی»› ☰ سرازیر

**سەرەولێژایی** / serewlêjayî/: ☜ سەربەرەخوار

**سەرەولێژە** / serewlêje/: ☜ سەرەولێژی

**سەرەولێژی** / serewlêjî/: ناو. سەرەوخوارە؛ سەرولێژە؛ سەربەرەژێرە ☰ سرازیری

**سەرەوناو** / serewnaw/: ناو. سەرەوناوە؛ سەرەولێژ؛ ئاماڵ سەرەوژێر ☰ سراشیبی اندک

**سەرەوناوە** / serenawe/: ☜ سەرەوناو

**سەرەونخون** / serewn(i)xûn/: ☜ سەرنخون

**سەرەونگوم** / serewn(i)gûm/: ☜ سەرنخون

**سەرەونگون** / serewn(i)gûn/: ☜ سەرنخون

**سەرەوە** / serewe/: ئاوەڵکار. سەرۆ؛ لای سەروو؛ بەرانبەری خوارەوە ‹لە سەرەوە دایناوە، لە خوارەوە بۆی دەگەڕێ!› ☰ سمت بالایی؛ بالا

**سەرهات** / serhat/: ناو. سەرهاتی؛ بەسەرهات؛ ڕووداو؛ ڕووداى ☰ رویداد

**سەرهاتی** / serhatî/: ☜ سەرهات

**سەرهار** / serhar/: ئاوەڵناو. بزۆز؛ دانەسەکناو ☰ بازیگوش؛ ناآرام

**سەرهاڕ** / serhař/: ناو. بەردی سەرووی ئاسیاو؛ بەرداشی سەرەوە ☰ سنگ آسیای بالایی

**سەرهشک** / serhişk/: ☜ سەروشك

**سەرهۆز** / serhoz/: ناو. سەرۆک عەشیرەت ☰ سردار ایل

**سەرهۆستا** / serhosta/: ناو. سەروەستا ☰ أستادباشی

**سەرهوویشک** / serhûyşik/: ☜ سەروشك

**سەرهەنگ** / serheng/: ناو. ١. شاهەنگ؛ داکی مێشەنگوینان ٢. ئەفسەری خاوەن پلەی سەرهەنگی ☰ ١. ملکەی زنبورها ٢. سرهنگ

**سەرهیچک** / serhîçik/: ناو. جۆرێ ماسی ☰ نوعی ماهی

**سەرهیشک** / serhîşk/: ☜ سەروشك

**سەرهێش** / serhêş/: ☜ سەرێش

**سەرهێڵ** / serhêł/: ناو. هەوگە؛ شوێنی لا کردنەوەی گاجووت ☰ جای چرخیدن گاو شخم

**سەری**[1] / serî/: ناو. ١. نۆبە؛ نۆرە؛ سەرە ٢. پاژ؛ بەش؛ بەشە ٣. کۆمەڵ؛ ئاپۆرە ٤. سەلک؛ سەرک؛ یەک بن ☰ ١. نوبت ٢. قسمت؛ سهم ٣. توده ۴. واحد شمارش سیر و پیاز و...

**سەری**[2]: ئامراز. ١. سەرەتای؛ دەسپێکی ‹سەری ساڵ› ٢. لای؛ کنی ‹بردمە سەری ئوسا› ٣. بانی؛ لە سەر ‹سەری سفرە؛ سەری مێز› ٤. کاتی؛

وەختی ‹سەری نان خواردن› ٥. لە سەر؛ بە هۆی ‹شەڕتان سەری چییە؟› ☰ ١. سرِ ٢. نزدِ ٣. رویِ ٤. هنگامِ ٥. به خاطرِ

**سەریاڵ** / seryal/: ناو. ١. زینوو؛ ملەی کێو ٢. کەنارەی کێو ☰ ١. گردنه ٢. ستیغ

**سەریت** / serît/: ناو. کلۆش؛ ساقەتەی دەخڵ ☰ ساقەی غله

**سەریلۆک** / serîlok/: ناو. گۆرانی و ئاهەنگی تایبەتی هاتنی بەهار ☰ ترانەی بهارانه

**سەرین** / serîn/: ناو. ١. ☜ **سەرنگا** ٢. شیاکە؛ ڕیخ؛ سنێر ☰ ١. ☜ **سەرنگا** ٢. سرگین

**سەرینا** / serîna/: ☜ **سەرنگا**

**سەرینچاوە** / serînçawe/: ☜ **سەرچاوە**

**سەرینگا** / serînga/: ناو. ١. ☜ **سەرنگا** ٢. شیاکە؛ سەرانوێلک ☰ ١. ☜ **سەرنگا** ٢. شوله

**سەرینمار** / serînmar/: ناو. شەیتانۆکە؛ هێلکەشەیتان ☰ حلزون

**سەریوان** / serîwan/: ناو. ١. تەپۆلکی خۆڵ و زبڵ ٢. سەرانگوێلک؛ جێگەی لێڕشتنی پەین و ڕیخ ‹گوڵی سەر سەریوانە، نەک پێ بخلەتی!› ☰ ١. تودەی زُباله ٢. سرگینگاه

**سەریەک** / seryek/: ئاوەڵکار. لە سەریەک: ١. تێکڕایی؛ گشلەگش؛ سەرپاک ٢. لە بان یەکتر ☰ ١. همگی ٢. بر روی هم

**سەرێ** / serê/: ☜ **سەرێك**

**سەرێش** / serêş/: ناو. ١. سەرهێش؛ ئامرازی جووت بە تێکڕایی ٢. ئەو بەشە لە ئامرازی جووت کە گاوەسنی لەسەر سوار دەکەن ☰ ١. ابزار شخم‌زنی ٢. خیش

**سەرێشە** / serêşe/: ☜ **سەرنێشە**

**سەرێک** / serêk/: ئاوەڵکار. سەرێ؛ ماوەیەکی کەم ‹سەرێک هات و زوو ڕۆیشت› ☰ لختی

**سەرێن** / serên/: ناو. سەردەم؛ سەرێنی؛ ماوەی ژیان ‹لە سەرێنی خۆیا وەسیەتی کردبوو› ☰ زمان؛ روزگار

**سەرێنی** / serênî/: ☜ **سەرێن**

**سەڕ** / seř/: دەنگەناو. سەڕە؛ زەڕ؛ دەنگی زەڕینی کەر ☰ عرعر

⊡ **سەڕ هاتن:** *[پلار]* سەر لێشێوان لە خۆشیان ☰ از فرط راحتی راه و رسم زندگی را فراموش کردن

**سەڕاف** / seřaf/: ناو. سەڕڕاف؛ پارەگۆڕ؛ پارەفرۆش؛ پووڵگۆڕەوە ☰ صرّاف

**سەڕافی** / seřafî/: ناو. ١. کاری پارەگۆڕینەوە ٢. دوکانی ئەو کارە ☰ ١و٢. صرّافی

**سەڕان** / seřan/: چاوگ. سەڕین؛ زەڕینی کەر ☰ عرعر کردن

**سەڕاندن** / seřandin/: چاوگ. سەڕانن؛ سەڕنای؛ زەڕەزەڕ کردن ☰ عرعر کشیدن

**سەڕانن** / seřanin/: ☜ **سەڕاندن**

**سەڕای** / seřay/: چاوگ. سەڕان ☰ عرعر کشیدن

**سەڕتەی** / seřtey/: ☜ **سرین ـ١**

**سەڕداندن** / seřdandin/: چاوگ. لە کەو دان؛ بە بێژنگی کون گەورە دابێژتن ☰ الک کردن

**سەڕڕ** / seřř/: دەنگ. دەنگی هاندانی کەر بۆ سەڕاندن ☰ صدای تحریک خر به عر ـ عر کردن

**سەڕڕاف** / seřřaf/: ☜ **سەڕاف**

**سەڕسەڕ** / seřseř/: ناو. بای ساردی بەتەوژم و سڕکەر ‹هەوری خەفەتە بەفری غەمی داوە بە سەرما؟ یا سەڕسەڕی دووریتە کە لێی کردمە سەرما؟! «حەریق»› ☰ باد صرصر

**سەڕسەڕخانە** / seřseřxane/: ناو. *[کینایە]* خانووی زۆر سارد ☰ خانەی بسیار سرد

**سەڕنای** / seřnay/: ☜ **سەڕاندن**

**سەڕە** / seře/: دەنگەناو. زەڕە؛ هاواری کەر ☰ عرعر

**سەڕەت** / seřet/: ☜ **سەرەند**

**سەڕەد** / seřed/: ☜ **سەرەند**

**سەڕەسەڕ / seřeseř/**: دەنگەناو. سـەڕەی زۆر و لـە شوێن یەک ▪ عر ـ عر پیاپی

**سەڕەن / seřen/**: ☜ **سەرەند**

**سەڕەند / seřend/**: ☜ **سەرەند**

**سەڕین / seřîn/**: ☜ **سەڕان**

**سەشەمبی / seşembî/**: ☜ **سێشەممە**

**سەعات / se'at/**: نـاو. سەحات؛ سـەعاتە؛ کـاتژمێر؛ دەمژمێر؛ گووسک: ١. سەعاتە؛ کەرەسەیەک بـۆ پێوانی زەمان و دیاری کردنی کـات ‹سـەعاتێکی زێـڕی لـە مەچـەک کردبـوو› ٢. کاتـێ کـە ئـەو کەرەسەیە نیشـانی دەدا ‹سـەعاتی دوو دەگاتـەوە ماڵ› ٣. یەکەی پێوانی کات بەرامبەر بە بەشێک لە ٢٤ بەشی شەو و ڕۆژێک ‹دوو سەعاتـی تـر ڕێ دەکەوین› ▪ ١تا٣. ساعت

**سەعاتە / se'ate/**: ☜ **سەعات**

**سەعانە / se'ane/**: ☜ **سەحانە**

**سەعبانە[1] / se'bane/**: ناو. نانی بەیانی ▪ صُبحانە

**سەعبانە[2]**: ئاوەڵکار. کاتی بەیانی ▪ صُبحگاه

**سەعدانی / se'danî/**: ☜ **سادانی**

**سەعلەب / se'leb/**: ☜ **سالمە**

**سەعوە / se'we/**: ناو. تۆرەمە باڵندەیەکی بچووکن، دندووکیان باریک و تیژە و چوارجۆریان هەیـە ▪ صعوە

**سەعەند / se'end/**: نـاو. سـەحەند؛ سـەحەنچە ▪ تشت کوچک

**سەعی / se'î/**: ناو. تەقالا؛ کۆشش ▪ کوشش

**سەغ / seğ/**: ☜ **سەخ**

**سەغبیر / seğbîr/**: ☜ **سەخبیر**

**سەغدە / seğde/**: ناو. سەدەقە؛ خێر لە ڕای خـوادا ▪ صدقە

**سەغڵەت / seğłet/**: ☜ **سەخڵەت**

**سەغی / seğî/**: ☜ **سەخی**

**سەغیر / seğîr/**: ☜ **سەخیر**

**سەغیربار / seğîrbar/**: ☜ **سەخیربار**

**سەف / sef/**: ناو. ڕیز؛ زنجیرە؛ شتی بە پاڵ یەکەوە ▪ صف؛ ردیف

**سەفا / sefa/**: نـاو. ١. شەنگی؛ تـەرچکی؛ پـاراوی؛ گەشی؛ تەڕوبەڕی؛ تەڕی و تازەیی ‹ئەو ڕۆژانە ئەم باخە سەفایەکی بوو› ٢. *[مەجاز]* هاودڵی؛ یەکدڵـی؛ دۆستایەتی و یەکڕەنگی ‹مـرۆی باسـەفا› ▪ ١و٢. صفا

⊡ **سەفا دان**: پاک و خاوێن کردنەوە ‹دەم و چاوی سەفا دابوو؛ سەر و ڕیش سەفا دان› ▪ صفا دادن

**سەفا هێنان**: بوونە هۆی شادی و خۆشی ‹مێمان خوەش هاتی، سەفا هاوردی› ▪ صفا آوردن

**سەفان / sefan/**: ناو. سـەفین؛ زنجـیرەی چیـا ▪ سلسلە جبال

**سەفت / seft/**: نـاو. ١. کۆڵەکەی ئەسـتوور و بڵـند ٢. لە دەفتەری میریدا نووسینی پسوولەی مڵـک ▪ ١. ستون بزرگ ٢. ثبت

**سەفتە / sefte/**: ناو. کـاری لـە سـەر یـەک دانـان ‹قاقەزەکان سـەفتە بکە!› ▪ عمل برهم چیدن

**سەفدڕ / sefdiř/**: ئاوەڵـناو. *[مەجاز]* بـوێر؛ نـەترس؛ بەجەرگ؛ ئازا ▪ شُجاع

**سەفرا / sefra/**: ناو. ١. زەرداو ٢. یـەک لـە چـوار خلتی سەرەکی لـەش، بـە پێـی بژیشـکی کـۆن (سێتریان: خوێن، بەلغەم، سەودا) ▪ ١و٢. صفرا

⊡ **سەفرا جۆشیان**: *[کینایە]* زۆر تووڕە و قەڵس بوون ▪ عصبانی شدن

**سەفرابەر / sefraber/**: ☜ **سیپەلە**

**سەفۆر / sefor/**: ☜ **سمۆرە ـ١**

**سەفۆری / seforî/**: ☜ **سمۆرە ـ١**

**سەفە / sefe/**: ناو. ڕیز؛ سەف ▪ صف

**سەفەر / sefer/**: ناو. ١. گەشتوگێڵ؛ یـۆم؛ کـار و ڕەوتی لـە شـار یـان وڵاتێکـەوە بـۆ شـار یـان وڵاتێکیتر ڕۆیشتن ٢. جار؛ کەڕەت ‹ئەم سەفەرە

قسە بکا، دەمی دەشکێنم› 🇮🇷 ١. سفر ٢. دفعه؛ بار

**سەفەربەر** / seferber/: ☜ **ڕەشبگیر**

**سەفەرنامە** / sefername/: ناو. گەشتنامە؛ نووسراوەیێ کە بەسەرهاتی سەفەری تێدایە ‹سەفەرنامەی ڕیچ بۆ کوردستان› 🇮🇷 سفرنامه

**سەفەقیتە** / sefeqîte/: ناو. چوڕەپۆپنە؛ چوڕەکلاونە 🇮🇷 چکاوک کاکُلی

**سەفەڵە** / sefeḻe/: ئاوەڵناو. سپڵە؛ سفلە ‹سەی نان دە، سەفەڵەی نان مەدە! «مەسەل»› 🇮🇷 ناسپاس؛ قدرنشناس

**سەفی** / sefî/: ئاوەڵناو. سەفیچ؛ سەفیح؛ سەفێح؛ کەمئاوەز؛ حۆل 🇮🇷 سفیه

**سەفیچ** / sefîc/: ☜ **سەفی**

**سەفیح** / sefîĥ/: ☜ **سەفی**

**سەفیر** / sefîr/: ☜ **باڵوێز**

**سەفیک** / sefîk/: ناو. ١. هەیوانۆکە؛ بانێژەی گچکە ٢. پالۆینە؛ پالێوکە 🇮🇷 ١. تراس کوچک ٢. صافی

**سەفین** / sefîn/: ☜ **سەفان**

**سەفێح** / sefêĥ/: ☜ **سەفی**

**سەڤا** / seva/: ناو. ڕزگاری؛ بار و دۆخی ڕزگار بوون 🇮🇷 رهایی

**سەڤی** / sevî/: ☜ **سەوەتە**

**سەق** / seq/: ناو. ١. داربەڕووی ئەستوور ٢. کاری ساوینی تێخ بۆ تیژ کردن 🇮🇷 ١. تنەی قطور بلوط ٢. عمل سوهان زدن تیغ

**سەقا**[١] / seqa/: ناو. ١. ئاوکێش؛ ئاوبەری مالان ٢. ☜ **سەقاقوش** 🇮🇷 ١. سقّا ٢. ☜ **سەقاقوش**

**سەقا**[٢]: ئاوەڵناو. ١. تەکووز؛ ڕێکوپێک ٢. تێراو؛ پاراو 🇮🇷 ١. منظم؛ مرتب ٢. سیراب

▣ **سەقا دان**: تەکووز کردن؛ ڕێکوپێک خستن 🇮🇷 ترتیب و تنظیم کردن

**سەقاقوش** / seqaquş/: ناو. سەقا؛ کەڵک؛ مەلێکی گەورەی دندووک زلی سپی ـ بۆرە، بەرچێلەی قورتمێکی وەکوو کیسەیە ماسی و ئاوی تێ دەکا 🇮🇷 پلیکان؛ مُرغ سقا

**سەقام** / seqam/: ناو. ١. تەکووزی؛ ڕێکوپێکی ٢. بەرقەراری؛ پایەداری * هەروەها: **سەقام گرتن** 🇮🇷 ١. تنظیم؛ ترتیب ٢. پایداری؛ ثبات

**سەقامگرتوو** / seqamgirtû/: ئاوەڵناو. بەرقەرار؛ دامەزراو 🇮🇷 پابرجا

**سەقامگیر** / seqamgîr/: ئاوەڵناو. بەرقەرار؛ جێگرتوو 🇮🇷 پایدار

**سەقاملووس** / seqamlûs/: ☜ **شەقاقلووس**

**سەقاو** / seqaw/: ناو. ١. نەخووشی ئیسقایی یەکسم ٢. سەقڵاو؛ ناوی جۆرێ ڕمب 🇮🇷 ١. نوعی بیماری ستور ٢. نوعی نیزه

▣ **سەقاو هەڵگرتن**: پەڵەدان؛ تێراو بوونی زەوی لە باران 🇮🇷 سیراب شدن زمین از باران

**سەقایی** / seqayî/: ناو. ئاوکێشی 🇮🇷 تنبل

**سەقر** / seqr/: ناو. باڵندەیەکە لە تیرەی بازەکان و تۆرەمەی هەڵۆیان، نێریان ٣٠ و مێ ٣٣ سانتیمیترە، لە واشە بچووکتر و بۆرایی پشتی کاڵترە، کلکی چوار تا پێنج خەتی پانی قاوەیی تێدایە، بەرچێلەی سپی ئاماڵزەردە، بەرزگی خورماییە 🇮🇷 پیغوی کوچک

▣ **سەقری مێشخۆر**: ☜ **پەڕبەڵەکە**

**سەقف** / seqf/: ☜ **سرمیچ**

**سەقلە** / seqle/: ناو. پندری؛ گرفت؛ قەبزی 🇮🇷 یبوست

**سەقڵاو** / seqław/: ☜ **سەقاو ـ٢**

**سەقەت**[١] / seqet/: ئاوەڵناو. ١. عەیبدار؛ زەدەدار ‹هەرچی هەوڵیدا دەستی سەقەت بوو/ سەنعەتی خۆشی لە دەستی دەرچوو! «قانع»› ٢. خەتەر؛ بڤە ‹پیاوێکی سەقەتە، ناوێرم بە لایدا بچم› ٣. سەکەت؛ سەکەت: ئـ) مردارەوبووی یەکسم ب) تۆپیوی کەر و سەگ ‹کە تاژی ڕاوی پێ نەکرا و سەقەت

بوو› ٤. لەکارتە؛ قوڕازە؛ ئاسنجاو ☰ ١. معیوب؛ زدەدار ٢. خطر ٣. مُردار ۴. قُراضه

**سەقەت**[٢]: دەنگ. تەڕ؛ وشەی گاڵتە پێ‌کردن لە ئەنجام نەدانی کارێ ‹سەقەت هاتی!؛ سەقەت کردت!› ☰ کلمەی تمسخر و کنایه

**سەقەتفرۆش** / seqetf(i)roş/: ناو. کەسێ کاسبییەکەی ئاسنجاو فرۆشتنە. هەروەها: **سەقەتفرۆشی** ☰ اوراقچی

**سەقەر** / seqer/: ناو. بەستەڵەک؛ شەختە؛ سەهۆڵبەندان ☰ یخبندان

**سەقەڵو** / seqeło/: ئاوەڵناو. تەمەڵ؛ تەمبەڵ ☰ تنبل

**سەقەم** / seqem/: ناو. سەرما و سۆڵەی زۆر دژوار ☰ سوز و سرمای سخت

**سەقەمی** / seqemî/: ناو. جۆرێ نەخۆشی یەکسمە ☰ از بیماری چهارپایان

**سەقی** / seqî/: ناو. جۆرێ بەردی مەڕمەڕی زەرد ☰ نوعی مرمر زرد

**سەقیل** / seqîl/: ئاوەڵناو. ڕەزیل؛ ڕژد؛ چکووس؛ دەس‌قووچاو ☰ خسیس

**سەکار** / sekar/: ناو. ١. ساقۆڕ؛ سەبەتەی گەورەی کا کێشان ٢. جۆرێ کورتانی ڕاست و ساف ☰ ١. سبد بزرگ کاهکشی ٢. نوعی پالان

**سەکانن** / sekanin/: چاوگ. ١. چەسپاندن؛ لکاندن ٢. جنێو دان ☰ ١. چسباندن ٢. دشنام دادن

**سەکت** / sekit/: ☜ **سەقەت**[١]ـ٣

**سەکتە** / sekte/: ناو. شەپلە؛ جەڵتە؛ وێست؛ قۆتک؛ مفاجات؛ موفاجات؛ دۆخ یان چۆنیەتی وەستانی لەنکاوی دڵ یان مێشک ☰ سکته

⊡ **سەکتە کردن**: شەپلە لێدان؛ جەڵتە لێدان ☰ سکته کردن

**سەکتە گرتن**: جەڵتەی ناتەواو لێدان و لە کار کەوتن ☰ سکتەی ناقص کردن و زمینگیر شدن

**سەکتین** / sektîn/: چاوگ. ١. مردنی یەکسم؛ سەقەت بوون ٢. شکاندن؛ قەڵەشتن ☰ ١. سقط شدن ٢. شکافتن

**سەکر** / sekr/: ناو. کاری داخستن؛ بەستن؛ پێوەدانی دەرک و پەنجەرە ☰ عمل بستن در و پنجره

⊡ **سەکر کردن**: داخستن؛ پێوەدان ‹خۆڵ دەبارێ، دەرگاکە سەکر کە!› ☰ بستن

**سەکرە** / sekre/: ناو. زەرک؛ پیان ☰ ظرف آبخوری

**سەکسار** / seksar/: ناو. ١. جۆرێ مەیموون ٢. جوێنێکە واتا: وەک سەگ ☰ ١. نوعی بوزینه ٢. دُشنامی است

**سەکنان** / seknan/: ☜ **سەکنین ـ٢**

**سەکنی** / seknî/: ئاوەڵکار. بەپێوە؛ ڕاوەستاو ☰ ایستاده

**سەکنین** / seknîn/: چاوگ. ساکنای: ١. ڕاوەستان؛ بە پێوە بوون ٢. سەکنان؛ داسەکنان؛ ئارام بوون ☰ ١. ایستادن روی پا ٢. آرام گرفتن

**سەکوت**[١] / sekut/: ناو. سەکووم؛ بیچم ☰ ریخت و قیافه

**سەکوت**[٢]: پێرۆ. ← **سەروسەکوت**

**سەکۆ** / seko/: ناو. دکە؛ بەرزایی لە بەرد یان حەڕی چێکراو بۆ لە سەر دانیشتن ☰ سکو

**سەکووم** / sekûm/: ☜ **سەکوت**

**سەکەت** / seket/: ☜ **سەقەت**[١]ـ٣

**سەکەر** / seker/: ☜ **سەرسەکەر**

**سەکەماتی** / sekematî/: ئاوەڵناو. لات و هەرزەی بێ‌ئاگار ☰ لات

**سەکین** / sekîn/: چاوگ. هاڵ بوونەوە؛ ئاڵ بوونەوەی ددان بە ترشی ☰ کرخ شدن دندان از ترشی

**سەگ**[١] / seg/: ناو. سە؛ سپەر؛ سپەڕ؛ سەو؛ سەی؛ سپلۆت؛ سلپۆت؛ سەپەکە؛ بەشدار؛ چوارپێ؛

کۆچەک؛ کوچک؛ کووچک؛ کوسۆک؛ کسۆک؛ گەماڵ (نێر)؛ دەڵ (مێ)؛ کووتی؛ تووتە؛ کەڵپ؛ گیانەوەری گوانـدار و گۆشـتخۆری کـەوی، پەنجەڕۆ، بە چوار قامکی کۆوەبوو لە پێدا، کە لـە گورگەوە نزیکە ⧉ سگ

⊡ **سەگ بە حەسار:** */کنایە/* سەگ بە حەوشە: ١. هاتوچۆکەری لە هیچ ٢. ماڵ پڕ لە قیڕە و هەرا ⧉ ١. بی دلیل در رفتوآمد ٢. دارای خانەی پُرآشوب

**سەگ بە حەوشە:** ☜ **سەگ بە حەسار**

**سەگ پاسوتیاگ:** ☜ **سەگی پێسوتاو**

**سەگپسینکە:** */کنایە/* کەروێشکی بەهارەزێ لە پاییزدا کە زۆر بزیوە و سەگ نایگرێ ⧉ خرگوش بهارزاده در پاییز

**سەگی پێسوتاو:** */کنایە/* سەگ پا سووتیاگ؛ مالانگەڕی هەدانەدەر ⧉ ولگرد

**سەگی پێسوتو:** */کنایە/* سەگی پێ سووتاوو ‹دونیا سەگی لە ئوغلەمە تۆقیوە تالیبی/ نەیماوە، هەر وەکوو سەگی پێسووتوو ڕاحەتی «حاجی قادر»› ⧉ ولگرد

**سەگی ڕەش:** */کنایە/* مرۆی تاوانباری خوێڕی ⧉ سگ روسیاه

**سەگی هار:** سەگەهارە: ١. سەگێ کە نەخۆشی هاری گرتبێ ٢. */کنایە/* مرۆڤی شەڕفرۆش ⧉ ١. سگ هار ٢. آدم لاتِ ماجراجو

**سەگی هەواران:** */کنایە/* سەگی بەرەڵا؛ نمانای خوێرییەتی؛ خۆتێهەڵقوتێنی و بێکارەیی ⧉ سگ حسن دله

⊡ **سەگ (تێ) بەردان:** سەگ تێ ڕیان؛ گوو تێ بوون ‹خوێنی هاوخوێنت ئەڕێژی نۆکەری ئەگریتە دۆس/ هەی سەگم بەردایە زێڕ و لیرە و دیناری تۆ «قانع»› ⧉ نوعی نفرین

**سەگ خاوەنی خۆ نەناسین:** */کنایە/* زۆر زلە و تێکەولێکە بوون ‹ئەوندە ژلۆق بوو، سەگ خاوەنی خۆی نەدەناسی› ⧉ سگ صاحبش را نشناختن

**سەگ ڕەوین:** ☜ **سەگ وەڕین**

**سەگ وەڕین:** سەگ ڕەوین؛ حەپە کردن ⧉ پارس کردن

**سەگی جێگایەک نەبون:** خاوەنی هیچ بایەخ و نرخێک نەبوون ‹ئاغا سەگی کوێیە، من لێرە دەربکا!› ⧉ سگ کسی نبودن

**سەگ**[٢]: ناوەڵناو. */مەجاز/* ١. فێڵباز؛ فەنباز ٢. زیرەک؛ وریا ⧉ ١. حیلەگر ٢. زیرک

**سەگاڤ** / segav/: ناو. سەگاڤی؛ سەگالا؛ سەگاو؛ سەگاوی؛ سەگگلاوک؛ سەگلاو؛ سەیاڤ؛ جانەوەرێکە لە ئاوا دەژی و کونی لە دەم ئاوە و کەوڵی بەنرخە ⧉ سگلاب؛ سگ آبی

**سەگاڤی** / segavî/: ☜ **سەگاڤ**

**سەگالا** / segala/: ☜ **سەگاڤ**

**سەگانە**[١] / segane/: ناوەڵناو. */کنایە/* فێڵاوی؛ تێکەڵ بە گزیکاری و پیلانگێڕی ‹کاری سەگانەی وا بە من ناکرێ!› ⧉ شیطنتآمیز

**سەگانە**[٢]: ناوەڵکار. */کنایە/* فێڵەبازانە ‹هەرچی وەکوو بەیانم بۆ کردوون بەتەحقیق/ پەیدا دەبن سەگانە، کام قوڕ بکەین بە سەرمان؟ «حاجی قادر»› ⧉ حیلەگرانە

**سەگانی** / seganî/: ناوەڵناو. حیلەباز؛ فەنباز ⧉ حُقەباز

**سەگاو** / segaw/: ☜ **سەگاڤ**

**سەگاوی** / segawî/: ☜ **سەگاڤ**

**سەگایەتی** / segayetî/: ☜ **سەگیەتی**

**سەگباب** / segbab/: ناو. باوکسەگ (جنێوێکە) ⧉ پدرسگ

**سەگبایی** / sebayî/: ناو. ١. باداری سەگ ٢. نەخۆشییەکە لە سەرما و سەغڵەتدا یەکسەم تووشی دەبێ و پاشووی لە جووڵە دەکەوێ و لە سەر پێشەوەی ڕادەوەستێ و کەفەڵی لە ئەرز

دەخشێنێ ☰ ١. مرض سگ ٢. از بیماری‌های ستور

**سەگبزوینك** / segbizwînik/: ناو. سەگپسێنکە؛ کەروێشکی یەکساڵە کە زۆر خێرا نییە زوو خۆی دەرباز کا و سەگیش نایگاتێ، ئەوەندەی بە دوای خۆدا ڕادەکێشێ هەتا تەواو شەکەتی دەکا ☰ خرگوش یکساله

**سەگپسێنکە** / segp(i)sênke/: ☜ سەگبزوینك

**سەگتۆپێن** / segtopên/: ناو. ١. کەسێ کە کاری کوشتنی سەگە ٢. کارەڕەهاتی کوشتنی گیانداری بە ئازار و جەزرەبەی زۆرەوە ‹ئەسپی بەستەزمان، دەشیکوژن بۆ سەگتۆپێنی دەکەن؟› ٣.*[کینایە]* کاری لێدانی زۆر و بێ بەزە ‹هێندەیان لێ داوە، سەگتۆپێنیان کردووە!› ☰ ١. قاتل سگ‌ها ٢. کار زجرکُش کردن حیوانات ٣. کتک‌کاری مُفصل

**سەگحەسار** / segĥesar/: ناو. ١. سەگبەحەوشە؛ تەمبێی سەگ، لە حەوشەی گاڵەدرواداا ٢. ئازار و گێرە و کێشەی زۆر ☰ ١. تنبیه سگ در حیاط دربسته ٢.*[کینایە]* رنج و عذاب

**سەگدەس** / segdes/: ☜ سەگدەست

**سەگدەست**[١] / segdest/: ناو. سەگدەس؛ جمگەیێ لە ماشیندا کە چەرخ دەلکێنێ بە ئیکسێلەوە ☰ سگدست

**سەگدەست**[٢]: ئاوەڵناو. سەگدەس؛ تایبەتمەندی چارەوێیەک کە لە ڕۆیشتنا ئەژنۆی ویکدەکەون ☰ ویژگی چهارپایی که هنگام راه رفتن زانوهایش به هم می‌خورد

**سەگڕەو** / segřew/: ☜ سەگوەڕ

**سەگڕەوێن** / segřewên/: ☜ سەگڕەوێنەوە

**سەگڕەوێنەوە** / segřewênewe/: ناو. سەگڕەوێن؛ کەسێ کە سەگ لێی دەترسن ☰ کسی که سگ‌ها از او می‌ترسند

**سەگژی** / segjî/: ناو. *[پلار]* سەگمەرگی؛ ژیانی سەگی ☰ زندگی سگی

**سەگسار**[١] / segsar/: ناو. ١.*[پلار]* شتی سەگئاسا؛ شتی وەک سەگ ‹کە مردی نەقڵ ئەکا ڕۆحی خەبیست/ لە ئینسانی دەچێتە شکلی سەگسار «شێخ ڕەزا»› ٢. جۆینێکە واتا: وێنەی سەگ ☰ ١. سگسان ٢. سگ صفت (دُشنامی است)

**سەگسار**[٢]: ئاوەڵناو. *[پلار]* ناحەز؛ ناشیرین ☰ بدقیافه

**سەگڤان** / segvan/: ☜ سەگوان

**سەگگلاوک** / segg(i)ławik/: ☜ سەگاف

**سەگگورگ** / segg urg/: ☜ سەگورگ

**سەگگیان** / segg(i)yan/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* حەفتڕۆح؛ گیانسەخت ☰ هفت‌جان

**سەگلور** / seglûr/: ناو. لوورە؛ قرووسکەی درێژی سەگ ☰ زوزەی سگ

**سەگلاو** / segław/: ناو. ١. ☜ سەگاف ٢. سەگلاوک؛ جۆینێکە واتا: وەک سەگ گلاو ☰ ١. ☜ سەگاف ٢. سگ نجس (دُشنامی است)

**سەگلاوک** / segławik/: ☜ سەگلاو-٢

**سەگلاوی** / segławî/: ناو. جۆرێ ئەسپی ڕەسەن ☰ نوعی اسب اصیل

**سەگماسی** / segmasî/: ناو. جۆرێ ماسی ☰ سگ ماهی

**سەگمان** / segman/: ناو. ئاماج؛ ئامانج؛ نیشانە ☰ آماج

**سەگمەرگ** / segmerg/: ئاوەڵناو. *[پلار]* تایبەتمەندی کەسێ کە لە مردنە و نامرێ ‹مەپرسە بۆ لە دووری تۆ نەمردم/ کە من سەگمەرگم و گیانسەخت و دڵڕەق! «شێخ ڕەزا»› ☰ سگ‌جان

**سەگمەرگی** / segmergî/: ناو. دەرد و ئازاری زۆر ☰ درد و رنج بسیار

**سەگنەخۆر**[١] / segnexor/: ناو. *[کینایە]* زێڕ و زیو و پارە و پووڵ ☰ پول وجواهرات

**سەگنەخۆر**[٢]: ئاوەڵناو. ١. تایبەتمەندی هەر شتێ کە سەگ نەیخوا ٢.*[کینایە]* تایبەتمەندی خۆراکی

ناخۆش ﷼ ١. ناخوشایند سگ ٢. نامطبوع

**سەگوان** / segwan/: ناو. سەگڤان؛ نیشانەئەنگێو؛ تیرهاوێژی زانا و زەبردەست ﷼ تیرانداز ماهر

**سەگورگ** / segurg/: ناو. سەگ‌گورگ؛ سەگێک لە ڕەگەزی گورگ بێ ﷼ سگ گُرگی

**سەگوەڕ** / segweř/: ناو. سەگڕەو؛ سەوەڕ؛ حەپەحەپی لەسەریەکی سەگان ﷼ پارس گروهی سگ

**سەگور** / segûr/: ناو. بوومەلێل؛ بوولێل؛ سەرەتای بەیانی یان ئێوارە ﷼ گرگ‌ومیش

**سەگە** / sege/: سارستە. سەگەبۆر؛ ئەی سەگ (ئەم سارستە پێڕای باریقەلایی گەورەیە بۆ پچووکتر) ‹سەگە ئەوەت چۆن زانی؟!› ﷼ شیطون

**سەگەبۆر** / segebor/: ☜ **سەگە**

**سەگەزێ** / segezê/: ناو. چەکسە؛ زانی سەگ ﷼ زایمان سگ

**سەگەناز** / segenaz/: ☜ **سەگەناس**

**سەگەناس** / segenas/: ناو. سەگەناز؛ سەبنێسی ﷼ بیماری کشندەی سگ

**سەگەوان** / segewan/: ناو. ئاگاداری سەگ ﷼ سگبان

**سەگەهارە** / segehare/: ☜ **سەگی هار**

**سەگە . سەگە** / sege sege/: ناو. کار و ڕەوتی خۆ گێل کردن و خۆ بەستەزمان نیشان دان ﷼ تظاهر به سادگی

**سەگیەتی** / segyetî/: ناو. *[کنایە]* سەگایەتی؛ سەگێتی؛ سەگێنی؛ گزیکاری و فێڵبازی ﷼ شیطنت

**سەگێتی** / segêtî/: ☜ **سەگیەتی**

**سەگێنی** / segênî/: ☜ **سەگیەتی**

**سەڵ**[1] / sel/: ناو. ١. تەلاشەبەرد؛ تلیشەبەرد ٢. بەردی پان و تەنک ٣. ☜ **سەلە** ﷼ ١. پُلمە سنگ ٢. سنگ پهن و نازک ٣. ☜ **سەلە**

**سەڵ**[2]: ئاوەڵناو. خڕ؛ خرت؛ تۆپەڵ ﷼ مُدوَّر

**سەلاجە** / selace/: ☜ **سارنجۆك**

**سەلاخ** / selax/: ناو. کەوڵکەر؛ ئەوی پێست لە لەشی حەیوانی سەربڕاو دەکاتەوە و خەساری ناکا ﷼ پوستکن؛ سلّاخ

**سەلار** / selar/: ناو. سەلارە؛ سەلارێ؛ سەلارەژن؛ سەرەژن ﷼ کدبانو

**سەلارە**[1] / selare/: ☜ **سەلار**

**سەلارە**[2]: ئاوەڵناو. جوان و خوشیک ﷼ زیبا و دلکش

**سەلارەژن** / selarejin/: ☜ **سەلار**

**سەلارێ** / selarê/: ☜ **سەلار**

**سەلاقوچکانێ** / selaqûçkanê/: ناو. سەلاقووچکە؛ کاری خۆ هەڵگێڕانەوە ﷼ پُشتک

**سەلاقوچکە** / selaqûçke/: ☜ **سەلاقوچکانێ**

**سەلالیک** / selalîk/: ناو. سەلیلانک؛ ڕەوڕەوە ﷼ روروک

**سەلام** / selam/: سارستە. *[سووکەڵە]* سلاو؛ سلام؛ سلاڤ؛ سلاف؛ سلامەلێ؛ سلامەلێک: ١. شاگە؛ شەگە؛ شەگگە؛ وتەیێ کە لە سەرەتای دیمانە یان وتوویژ، لەگەڵ کەسێکدا دەگوترێ. هەروەها: **سەلام کردن** ٢. *[ئیسلام]* ڕستەگەلێ کە نوێژخوێن لە ڕکاتی ئاخری نوێژدا دەیڵێ. هەروەها: **سەلام دانەوە** ﷼ ١و٢. سلام

**سەلامەت** / selmet/: ☜ **سلامەت**

**سەلامەتی** / selmetî/: ☜ **سلامەتی**

**سەلایە** / selaye/: ناو. دەساوان؛ دەسکی ئاونگ ﷼ دستەی هاون

**سەلبەند** / selbend/: ناو. ڕێگەی بە بەرد خۆشکراو ﷼ راه سنگفرش

**سەلپ** / selp/: ناو. ١. ☜ **سەڵپ** ٢. جۆرێ دارەبی ﷼ ١. ☜ **سەڵپ** ٢. نوعی درخت بید

**سەلپان** / selpan/: چاوگ. چلکن بوون ﷼ کثیف شدن

**سەلپاندن / selpandin/**: چاوگ. ١. ☜ **سەڵپاندن** ٢. سەلپین؛ چڵکن کردن ☰ ١. ☜ **سەڵپاندن** ٢. آلودن؛ کثیف کردن

**سەلپین / selpîn/**: چاوگ. چڵکن کردن ☰ کثیف کردن

**سەلخ / selx/**: ناو. دوایین ڕۆژی مانگی قەمەری ☰ سَلخ

**سەلڤی / selvî/**: ☜ **سەوڵ ـ٢**

**سەلک / selik/**: ناو. ١. *[پلار]* سەری بنیادەم ٢. سەری حەیوان ٣. هەر شتی خڕ هەڵدراوی پڕ بە مشت ‹سەلکی ترخێنە؛ سەلکی تەشی› ٤. سەرک؛ بنە گیای خڕ و درشت ‹سەلکێک پیواز؛ دوو سەلک چەوەندەر› ٥. یەکەی پیسایی مرۆ ‹سەلکێک گوو› ☰ ١. کلّه ٢. سر حیوان ٣. گلوله شده با دست ۴. سوخ؛ پیاز یا ریشه‌های غُده‌ای گیاهان ۵. واحد مدفوع آدمی

**سەلک / selk/**: ناو. تریان؛ سەبەتەی پچووک ☰ سبد کوچک

**سەلکدار / selikdar/**: ئاوەڵناو. بنخڕ (بۆ گیا) ☰ دارای غده (گیاه)

**سەلکە / selke/**: ناو. ١. جۆرێ نەخشی مافوورە ٢. پیوازەی گیا ٣. *[پلار]* بنیادەمی سەر زل ☰ ١. نوعی نقش قالی ٢. پیازه‌ی گیاه ٣. سرگُنده

**سەلکەبزووت / selkeb(i)zût/**: ناو. سەرەبزووت؛ بسۆت ☰ نیمسوز

**سەلکەپیاز / selkep(i)yaz/**: ناو. سەرکەپیاز؛ دانەی پیواز ☰ دانه‌ی پیاز

**سەلکەتەشی / selketeşî/**: ناو. بارێسەدوخ؛ سەرەتەشی ☰ سرِدوک

**سەلمان / selman/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //سەلمای؛ دەسەلمێ؛ بسەلمێ// سەلەمیای؛ مسۆگەر/ مسەوگەر بوون؛ بێ سێ‌ودوو پەسند کران ‹شتی وا بە ئێمە ناسەلمێ› ☰ قطعی شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: سەلماو/ چاوگی نەرێنی: نەسەلمان

**سەلمانپیسە / selmanpîse/**: ناو. جۆرێ مارمێلکی ژەهردار ☰ نوعی مارمولک سمّی

**سەلماندن / selmandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //سەلماندت؛ دەسەلمێنی؛ بسەلمێنە// سەلەمنای؛ مسەوگەر کردن؛ قەبوولاندنی کار یان وتەیەک ☰ بە کرسی نشاندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەسەلماندن

**سەلمانی / selmanî/**: ناو. سەرتاشخانە؛ دەلاکخانە؛ ئارایشگا ☰ سلمانی

**سەلمەل / selmel/**: ناو. شاخبێزی؛ مەڕمەڕشا؛ مەڕمەڕش ☰ چلوار

**سەلمێنران / selmênran/**: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //سەلمێنرای؛ دەسەلمێنرێی؛ بسەلمێنرێ// مسۆگەر کران؛ وە بەر پەسند خران ☰ بە کُرسی نشانده شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: سەلمێنراو/ چاوگی نەرێنی: نەسەلمێنران

**سەلو / seliw/**: ☜ **سەوڵ ـ٢**

**سەلوو / selû/**: ☜ **سەوڵ ـ٢**

**سەلە / sele/**: ناو. سەل؛ نانەشان؛ سەبەتەی پان ☰ آبکش ترکه‌ای

**سەلەشیرک / seleşîrik/**: ناو. سەوین؛ سەبەتەی زل بۆ دەفر و هەوڕ ☰ سبد بزرگ جاظرفی

**سەلەم / selem/**: ناو. پێش‌فرۆش ☰ سَلَم

⊡ **سەلەم کردن:** بە شینکەیی و زۆر بە هەرزان، داهاتی مەزرا سەندن ‹با بەس بێ سەلەم کردنی ناو هۆبە و خێڵت/ ڕاستی کەرەوە فیکری دڵی چەوت و چەوێڵت «قانع»› ☰ سَلَم معامله کردن

**سەلەمخۆر / selemxor/**: ئاوەڵناو. کڕیاری دەخڵی مەزرا، بە شینکەیی ‹پێش ئەوەی حاجی سەلەمخۆر هەزارێک هەڵنێ بە تەماڵ/ پێش ئەوەی

ڕێچکە ببەستن بۆ مزگەوتێ شان بە بەرماڵ «هێمن» ☰ سَلَم‌خر

**سەلەمکڕ** / selemkiř/: ناو. پێشکڕ ☰ سَلَم‌خر

**سەلەمنای** / selemnay/: ☜ **سەلماندن**

**سەلەمیای** / selemyay/: ☜ **سەلمان**

**سەلەندە** / selende/: ☜ **سوانە**

**سەلیب** / selîb/: ناو. چەلیپا؛ خاچ ☰ صلیب

**سەلیقە** / selîqe/: ناو. سەرڕێژنە: ١. مشوور؛ فام؛ تێگەیشتوویی ‹پیاوێکی خاوەن سەلیقەیە› ٢. زەوق؛ بڕستی زەینی و هەستی کەس بۆ ناسینەوەی جوانی یان باشی ‹ئەو کراسەم سەلیقەی خوشکمە› ☰ ١و٢. سلیقه

**سەلیلانک** / selîlanik/: ☜ **سەلالیك**

**سەلیم** / selîm/: ئاوەڵناو. بێئازار؛ مەند؛ هێدی و هێمن ☰ سلیم

**سەلین** / selîn/: ناو. بەردی سەر گۆڕیچە ☰ سنگ سرپوش لحد

**سەلا** / sela/: ناو. ١. پەسلان؛ ڕۆژا پساتێ؛ ڕۆژی هەستانەوەی دوای مەرگ ‹هەموو کەسێک تامی مردنێ دەچێژێ؛ ڕۆژی سەلاش هەقی خۆتان دەنێنە مشت «هەژار، قورئان»› ٢. سەلات؛ کاری پاڕانەوە بە دەنگی بەرز بۆ پارشێو کردنی مانگی ڕەمەزان ‹مەلا سەعیدە وا سەلا ئەکا/ ڕۆحی بیلالمان بۆ ئەجیا ئەکا «پیرەمێرد»› ☰ ١. روز قیامت ٢. مُناجات سحری ماه رمضان

**سەلات** / selat/: ☜ **سەلا_٢**

**سەلان** / selan/: ☜ **سلان**

**سەڵپ** / selp/: ناو. سەلپ؛ سەلپی؛ سەول؛ بێلی بەلەم لێخوڕین ☰ پاروی قایقرانی

**سەڵپاندن** / selpandin/: چاوگ. سەلپاندن؛ پاڕوو لێدان ☰ پارو زدن

**سەڵپی** / selpî/: ☜ **سەڵپ**

**سەڵت**[1] / selt/: ناو. لاشە گۆشتی جگە لە دەست و ڕان ☰ لاشەی گوشت بدون دست و ران

**سەڵت**[2]: ئاوەڵناو. ١. ڕەبەن؛ بێژن؛ زگوردی؛ قازاخ ٢. تەنیا؛ بێهاوڕێ ☰ ١. مُجرد ٢. تنها

**سەڵتە**[1] / selte/: ناو. جلێکە لە سەر کەوای ئاودامێنەوە دەبەر دەکرێ ‹کەوا و سەڵتە› ☰ بالاپوش کوتاه روی قبا

**سەڵتە**[2]: ئاوەڵناو. بێهاوڕێ؛ تەنیا ☰ تنها

**سەڵتە**[3]: ئاوڵکار. تەنیا؛ تاقی‌تەنێ ‹حاجیم بەجێ هێشت و سەڵتە ڕۆیشتم «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ تنهایی

**سەڵتەزەلام** / seltezelam/: ناو. پیادەی تەنیا ☰ پیادەی تنها

**سەڵتەزینە** / seltezîne/: ناو. سواری تەنیا ☰ تک‌سوار

**سەڵتەقەمچی** / selteqemçî/: ناو. *[کینایە]* دەسبەتاڵ گەڕاوە (ڕاوچی) ☰ دست‌خالی برگشته (شکارچی)

**سەڵتەنەت** / seltenet/: ناو. پاشایەتی؛ پادشایی؛ شایی ☰ سلطنت

**سەڵتی** / seltî/: ناو. ١. ڕەبەنی؛ بێژنی ٢. تەنیایی؛ بێکەسی ☰ ١. مجردی ٢. تنهایی

**سەڵمکە** / selmke/: ناو. سەڵمۆکە؛ سەڵمەک؛ سەلەمکە؛ گیایەکە بۆ دۆکلیو دەبێ ☰ سلمه

**سەڵمۆکە** / selmoke/: ☜ **سەڵمکە**

**سەڵمۆکەکەرانە** / selmokekerane/: ناو. گیایەکە وەک سەڵمکە وایە، ناخورێ ☰ گیاهی است

**سەڵمەک** / selmek/: ☜ **سەڵمکە**

**سەڵو** / seliw/: ☜ **سەول_٢**

▣ **سەڵوا ڕەوان**: جۆرێ دارسەڵوی زۆر ڕاست و ڕێک ☰ سرو سهی

**سەڵوات** / selwat/: ناو. سلاوات؛ سلاوەت؛ دروود ☰ صلوات

▣ **سەڵوات ناردن**: ١. *[ئیسلام]* گوتنی ڕستەی

عەرەبی «اَللّهُمَ صَلِ عَلی مُحمَّد وَ آلِ مُحمَّد» واتا: درود و سەلامی خودا لە سەر پێغەمبەر و بنەماڵەی ٢. *[مەجاز]* کۆتایی هێنان بە دۆخێکی ناخۆش، بەتایبەت شەڕەقسە ☰ ١و٢. صلوات فرستادن

**سەڵەف** / seɫef/: ناو. ١. دانەلغاو ٢. ڕیبا؛ سووی پارە ٣. پڕتاویی ئەسپ ٤. قەرز؛ وام ☰ ١. دهانەی لگام ٢. ربا ٣. تاخت اسب ۴. وام

⊡ **سەڵەف کردن**: ١. قەرزکردنی بە سووت ٢. پڕتاو کردنی ئەسپ ☰ ١. وام نزولی گرفتن ٢. تاختن اسب

**سەڵەفخۆر** / seɫefxor/: ناو. سووخۆر ☰ رباخوار

**سەڵەمکە** / seɫemke/: ☜ **سەڵمکە**

**سەڵیتە** / seɫîte/: ناوەڵناو. *[پلار]* زماندرێژی بێحەیا ☰ سلیطه

**سەم** / sem/: ناو. ژار؛ زار؛ ژاڵ؛ سام؛ ژەقنەمووت؛ ماکێ کە بە هۆی کاردانەوەی کیمیاوی، وەزەنی بۆ گیانداران هەیە ☰ سَم

**سەما** / sema/: ناو. هەڵپەرکێ؛ دیلان؛ ڕەقس ☰ رقص

**سەماخ**[1] / semax/: ناو. پشوودرێژی؛ بینفرەهی ☰ شکیبایی

**سەماخ**[2]: ناوەڵناو. بەوەج؛ بێنیاز لە خەڵک ☰ دارای عزت نفس

**سەماد** / semad/: ناو. کووت؛ کوود ☰ کود

**سەماس**[1] / semas/: ناو. جەوهەری تیغی شێر و خەنجەر ☰ پرند

**سەماس**[2]: ناوەڵناو. هێمن؛ پشوولەسەرخۆ ☰ آرام

**سەماسی** / semasî/: ناو. کۆسە ماسی ☰ کوسە ماهی

**سەماک** / semak/: ناوەڵناو. زۆر بەرز و بڵند ☰ مُرتفع

**سەماکەر** / semaker/: ناو. کەسێ کە ڕەقس دەکا ☰ رقاص

**سەماکەرە** / semakere/: ناو. هەڵەکەسەمای گەورە؛ ناوی باڵندەیەکە ☰ دلیجه

**سەماگە** / semage/: ناو. دانسینگ؛ ژووری تایبەتی هەڵپەڕکێ و سەما لە ڕستووران یان کابارەدا ☰ دانسینگ

**سەمالەک** / semalek/: ناو. باڵدارێکی زل و زۆر قەڵەوە ☰ از پرندگان بزرگ‌جثه

**سەماڵی** / semaɫî/: ناو. کەوە؛ ئاوی ئاسمانی ☰ آبی آسمانی

**سەمانەک** / semanek/: ناو. هەوێردە؛ مەلێکی جنجیرە لە ڕەشۆلە زلتر، زۆرتر لە هەرزندا هێلانە دەکا ☰ بلدرچین

**سەماوار** / semawar/: ☜ **سەماوەر**

**سەماوەر** / semawer/: ناو. سەماوار؛ ئامرازی ئاو کولاندن بۆ چا لێنان ☰ سماور

**سەمبور** / sembûr/: ☜ **سەبون**

**سەمبە** / sembe/: ناو. مەتکەو؛ ئامرازی کون کردن (دار و دیوار و ...) ☰ متّه

**سەمت** / semt/: ناو. لا؛ ئالی؛ ڕەخ ☰ سمت

**سەمتاندن** / semtandin/: چاوگ. لە ئاوی گەرم هەڵکێشان ☰ در آب گرم فرو بردن

**سەمتک** / semtik/: ناو. پارێز؛ خۆپارێزی ☰ احتیاط

**سەمتور** / semtûr/: ☜ **سەنتور**

**سەمتورە** / semtûre/: ☜ **سەنتور**

**سەمتین** / semtîn/: چاوگ. کون کردن ☰ سُفتن

**سەمسیر** / semsîr/: ناو. تلپی ترێ ☰ تُفالەی انگور

**سەمور** / semûr/: ☜ **سمۆرە ـ١**

**سەمون** / semûn/: ناو. سووتەبا؛ گڕە؛ سەبوون؛ گڕەبا ☰ باد سام

**سەمە** / seme/: ناو. سەمبە؛ مەتکەو ☰ سُنبه

**سەمەت** / semet/: ناو. ئارامی؛ لەسەرخۆیی ☰ آرامی

**سەمەد** / semed/: ناو. هۆ؛ سەبەب ☰ سبب

**سەمەر**[1] / semer/: ناو. ١. کۆپانی چارەوێ ٢. بەهرە؛ قازانج ☰ ١. پالان ٢. ثمر

**سەمەر**[2]: ئاوەڵناو. سەرسووڕێن؛ عەجایب ☰ شگفت

**سەمەرگی** / semergî/: ناو. [پلار] دەرد و ڕەنج و شەکەتی ☰ رنج و مشقت

**سەمەرە**[1] / semere/: ناو. ١. ژان و دەرد ٢. قەڵپووزی زین ٣. جیازی وشتر ٤. ژێر جلی کا تێئاخنراوی جگە لە کورتان ٥. سەرگوروشتە ☰ ١. رنج؛ آزار ٢. قاچ زین ٣. پالان شُتر ۴. بخشی از پالان الاغ ۵. سرگذشت

**سەمەرە**[2]: ئاوەڵناو. سەمەر؛ سەرسووڕێنەر ☰ شگفت

**سەمەل** / semel/: ناو. قرسیل؛ بەرماوی لەوەڕ ☰ پسمانده چرای دام

**سەمەڵ** / semeł/: ناو. گیای خراپی گێرە نەکراوی لێکهاڵاو ☰ علف به هم پیچیدەی نکوبیده

**سەمەن**[1] / semen/: ناو. ١. گوڵی یاسەمەن ٢. ڕەنگی زەردی کاڵ ٣. ڕەنگی کەوە ☰ ١. گل سَمَن ٢. رنگ زرد روشن ٣. رنگ خاکستری

**سەمەن**[2]: ئاوەڵناو. ١. بە ڕەنگی زەردی کاڵ ٢. خۆڵەمێشی؛ بووڵین ☰ ١. زرد روشن ٢. خاکستری رنگ

**سەمەندۆک** / semendok/: ناو. کالان؛ سانجی؛ ساجووڕ ☰ قلاده

**سەمەندەر** / semender/: ناو. جانەوەرێکی ئەفسانەیی ☰ سمندر

**سەمەنگوڵ** / semenguł/: ناو. شیرین شەل؛ شەلێ کە زۆر کەم دەلەنگێ ☰ شَلی که اندک می‌لنگد

**سەمەنو** / semenû/: ☜ **سەمەنی**

**سەمەنی** / semenî/: ناو. سەمەنوو؛ هەڵوای لە شیرەی گەنمەفەریکە و ئارد ☰ سمنو

**سەمیت** / semît/: ناو. سەمید؛ ماکێکی ڕەش کە لە دەرگای خەڵێفە هەنگە ☰ مادەی سیاه رنگ جلو در کندوی زنبوران

**سەمید** / semîd/: ☜ **سەمیت**

**سەمیر** / semîr/: ناو. سەمسیر؛ تلفەی گووشراوی ترێ ☰ تُفالەی فشُردەی انگور

**سەنا**[1] / sena/: ناو. ١. ☜ **سنامەکی** ٢. پەرلەمانی پیران؛ یەکێ لە دوو پەرلەمانی قانوون دانان لە برێ وڵاتان ☰ ١. ☜ **سنامەکی** ٢. سنا

**سەنا**[2]: ئاوەڵناو. سانا؛ ئاسان ☰ آسان

**سەناتور** / senatur/: ناو. ئەندامی پەرلەمانی پیران ☰ سناتور

**سەناز** / senaz/: ناو. ڕۆخ؛ کەناری چەم ☰ کنارەی رودخانه

**سەنامەکی** / senamekî/: ☜ **سنامەکی**

**سەناهی** / senahî/: ناو. ١. سانایی؛ هاسانی ٢. ئارخەیانی؛ ئاسوودەیی ☰ ١. آسانی ٢. آسودگی

**سەنای** / senay/: ☜ **سەندن**

**سەنتور** / sentûr/: ناو. سەمتوور؛ سەمتوورە؛ سازی ژێداری دەندووکەیی بە ٧٢ ژێوە کە هەر چوار سیم بۆ دەنگێک کۆک دەبن و بە دوو میزرابی چێوی باریکەوە دەیژەنن ☰ سنتور

**سەنتە**[1] / sente/: ناو. کپی؛ بێدەنگی ☰ خاموشی

**سەنتە**[2]: ئاوەڵناو. پەنامەکی؛ نهێنی ☰ سرّی

**سەنتەر** / senter/: ناو. ١. ناوەند؛ چەق؛ ناوەڕاستی هەر شتێک ٢. ناوەندی بڕیار دان و بەڕێوەبەرایەتی ☰ ١و٢. مرکز

**سەنتەرالیزم** / senteralîzm/: ناو. ناوەندوازی؛ ناوەندخوازی؛ بڕوا بە پێویست بوونی ناوەندێکی بەهێز بۆ بڕیاردان و بەڕێوەبەرایەتی و فەرمانبەرداری لەو ناوەندە ☰ سانترالیسم

**سەنتەنە** / sentene/: ناو. دەبدەبە؛ شکۆ و جەلال ☰ شکوه

**سەنجنای** / senc(i)nay/: ☜ **سەنگاندن**

**سەنجۆر** / sencor/: ☜ **سەنجۆل**

**سەنجۆڵ** / sencoł/: ناو. سەنجۆر؛ کەڵەوە؛ کەڵەوانەی ملی گا ☰ چنبرەی گردن گاو در خیش

**سەندن** / sendin/: چاوگ. تێپەڕ. //سەندت؛ دەسێنی؛ بسێنە// سەنن؛ سەنین؛ ساندن؛ سەنای: ١. ئەستاندن ٢. کڕین ☰ ١. گرفتن ٢. خریدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەسەندن

**سەندنەوە** / send(i)newe/: چاوگ. تێپەڕ. //سەندتەوە؛ دەسێنییەوە؛ بسێنەوە// ساندنەوە؛ ئەستاندنەوە ☰ بازپس گرفتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەسەندنەوە

**سەندەلوس** / sendelûs/: ناو. دارچکێکی بچووک لە دەستەی سەوڵی کێوییە کە جەوییەکەی بۆ دەرمان دەبێ ☰ سندروس

**سەندەڵ** / sendeł/: ناو. ١. دارێکی بۆنخۆشە ٢. قاپقاپ؛ تەقتەقیلە؛ کەوشی لە دار ٣. گیازەرتک؛ گیایەکە ڕەنگی زەردی لێ دەگرن ☰ ١. چوب صندل ٢. دمپایی چوبی ٣. گیاهی کە از آن رنگ زرد گیرند

**سەندەڵی** / sendełî/: ناو. سەنگەڵی؛ سەنەڵی: ١. ئەسکەمل؛ ئەسکەملە؛ چتری؛ ئەسکەملی؛ منسکل؛ چواربەن؛ چواربەندە؛ ڕوونشتەک؛ قورسی؛ کورسی؛ ئامێرێک بە چوارپایەوە بۆ دانیشتنی یەک کەس لە سەری ‹سەندەڵییەکەی هێنایە پێشەوە و لە سەری دانیشت› ٢. جێگای دانیشتن لە ناو ماشین، قەتار و وەک ئەوانە ‹سەندەڵییەکەی منیان بە کەسێکی تریش فرۆشتووە!› ٣. *[مەجاز]* پلە و پایە ‹وەها پاڵی داوە بە سەندەڵی سەرۆکایەتییەوە ئێژی میراتی باوکییەتی!› ☰ ١تا٣. صندلی

**سەندیکا** / sendîka/: ناو. یەکیەتی؛ یەکێتی؛ ڕێکخراوەیێ کە لە یەکانگیر بوونی کەسان، تاقم یان وڵاتانی هاودۆز پێک دێ ☰ سندیکا

**سەنران** / senran/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //سەنرای؛ دەسەنرێی؛ بسەنرێ// سانیای؛ سەنیان؛ سنیان؛ سنیای؛ کڕدران ☰ خریداری شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: سەنراو/ چاوگی نەرێنی: نەسەنران

**سەنراو** / senraw/: ☜ سنیاگ ـ١

**سەنسکریت** / sensk(i)rît/: ☜ سانسکریت

**سەنسەنە** / sensene/: ناو. تەنتەنە؛ دەبدەبە؛ شکۆ ☰ خریداری شدن

**سەنعەت** / sen'et/: ناو. ١. کاربەند؛ پیشە ٢. پیشەسازی ☰ ١. پیشه؛ شغل ٢. صنعت

**سەنگ** / seng/: ناو. ١. *[ئەدەبی]* بەرد؛ بەر؛ کوچک؛ تەوەن؛ کەڤر؛ تەنی تۆکمە و پتەوی سروشتی کە لە خاک یان کانەگەلی جۆراوجۆر پێکهاتووە ٢. قورسایی؛ کێش ٣. *[مەجاز]* قەدر و حورمەت ☰ ١. سنگ ٢. وزن ٣. احترام و منزلت

◙ **سەنگی سەما**: جۆرێ دیلان ☰ نوعی رقص گروهی

**سەنگی مەحەک**: بەردی زێڕ ئەزموون ☰ سنگ محک

◘ **سەنگ دادان**: داخزانی منداڵی ناو زگ، کاتی لە دایک بوون ☰ پایین خزیدن بچه هنگام زایمان

**سەنگ گرتن**: مۆتە سوار بوون؛ قورس بوونی لەش لە خەودا بە هۆی گت تێ کەوتنی گەڕیانی خوێن ☰ کابوس دیدن

**سەنگ لێ نان**: *[کینایە]* سەنگ لێ نیان؛ حورمەت گرتن ☰ ارج نهادن

**سەنگ لێنیان**: ☜ سەنگ لێنان

**سەنگا** / senga/: ناو. ١. ☜ سەرنگا ٢. سەنگزاوەر؛ بەردی دژی ژەهر ☰ ١. ☜ سەرنگا ٢. سنگ پادزهر

**سەنگاتی** / sengatî/: ناو. قورسایی؛ گرانایی ☰ وزن

**سەنگان** / sengan/: چاوگ. سەنگیای: ١. قەبلان؛

بەراورد بوون ۲. تاقی بوونەوە ▆ ۱. ارزیابی شدن ۲. تجربه شدن

**سەنگاندن** / sengandin/: چاوگ. تێپەر. //سەنگاندت؛ دەسەنگێنی؛ بسەنگێنە// سەنگان؛ سەنگنای؛ سەنجنای: ۱. قەبلاندن؛ بەراورد کردن ۲. تاقی کردنەوە؛ ئەزموون؛ زمین ▆ ۱. ارزیابی کردن ۲. تجربه کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەسەنگاندن

**سەنگانن** / senganin/: ☜ **سەنگاندن**

**سەنگاو** / sengaw/: ناو. گۆلاوی باران ▆ محل جمع شدن آب باران

**سەنگایی** / sengayî/: ناو. سەنگاتی؛ قورسایی ▆ سنگینی

**سەنگباران** / sengbaran/: ناو. بەردەباران ▆ سنگباران

**سەنگتاش** / sengtaş/: ☜ **سەنگتەراش**

**سەنگتراش** / sengt(i)raş/: ☜ **سەنگتەراش**

**سەنگتەراش** / sengteraş/: ناو. سەنگتراش؛ سەنگتاش؛ بەردتاش؛ نەقار ▆ سنگتراش

**سەنگچن** / sengçin/: ناو. ۱. دیواری وشکەبەرد؛ ئیشکەکەڵەک ۲. کاری دەوری بیر لە ناوەوە بە بەرد هەڵچنین ▆ ۱. دیوار سنگچین ۲. سنگچینی دیوارەی چاه

**سەنگزاوەر** / sengzawer/: ناو. سەنگا؛ بەردی دژی ژەهر؛ بەردێکە گوایە هەر کەسێ پێ بێ، مار و دووپشک پێوە نادا ▆ سنگ پادزهر

**سەنگفەرش** / sengferş/: ☜ **سەنگفەڕش**

**سەنگفەڕش** / sengfeřş/: ناو. سەنگفەرش؛ ڕەقف؛ بەردەڕێژ؛ سەلبەند ▆ سنگفرش

**سەنگکار** / sengkar/: ناو. بەردکار؛ کەسێ کە بە بەردی خانووسازی کار دەکا، بەتایبەت ئەوەی بە جوانی لە پێکهاتەیەکدا دەیخاتە پەنا یەک ▆ سنگ‌کار

**سەنگکاری** / sengkarî/: ناو. بەردکاری: ۱. کاری بەرد کردن ۲. ئەوی لە بەرد چێ دەکرێ ▆ ۱و۲. سنگ‌کاری

**سەنگنای** / sengnay/: ☜ **سەنگاندن**

**سەنگوبەرد** / seng û berd/: سەنگەوبەرد ↓

⊡ **سەنگوبەرد نان**: ۱. لە ژێر شتێ گران دانان بۆ ڕاستەوە بوون ‹کلاشەکەم تەڕ بوو، سەنگوبەردم ناوە› ۲. *[کینایە]* دڵنیا/ ئارخەیان بوون ▆ ۱. زیر اجسام سنگین قرار دادن ۲. اطمینان یافتن

**سەنگوردوو** / sengurdû/: ☜ **سەرانگوێلك**

**سەنگوڕە** / senguře/: ناو. گۆلکی زۆر گۆشتنی غلوور ▆ گوسالەی چاق مغرور

**سەنگوڕەنگ** / seng û řeng/: ناو. ڕێز و قەدر ▆ ارج و احترام

**سەنگوسووژن** / seng û sûjin/: ↓

⊡ **سەنگوسووژن دان/ کردن**: بە وردی گەڕان و چاو گێڕان ‹ماڵەکەم سەنگوسووژن دا، نەمدۆزییەوە› ▆ به دقت همه جا را گشتن

**سەنگوسوک** / seng û sûk/: ناو. کار و ڕەتی سەنگاندن ▆ ارزیابی

**سەنگوڵ** / senguł/: ئاوەڵناو. ۱. *[پەلار]* تەژەی دزێو ۲. قەپەگۆڵ؛ زل و زەبەلاح (گەمال) ▆ ۱. گُندەبک ۲. قوی‌جُثه (سگ نر)

**سەنگۆ** / sengo/: ناو. گوێلپار؛ پانیر؛ پارین ▆ گوسالەی یکسالە

**سەنگەر** / senger/: ناو. چەپەر؛ خەڵ؛ مەتەرێز ▆ سنگر

⊡ **سەنگەر گرتن**: چوونە نێو سەنگەرەوە و خۆ ماتە دان ‹سەنگەری نەدەگرت، بە پێوە بەرەنگاری دوژمنان دەبوو «هەژار، چێشتی مجێور»› ▆ سنگر گرفتن

**سەنگەربەندی** / sengerbendî/: ناو. کاری چەپەر کۆڵین ▆ سنگربندی

**سەنگەرچە** / sengerçe/: ناو. ئاخیزگە؛ شوێنی سەرهەڵدان ‹سەنگەرچەی گولان جە نەو پەیدا بی/ عاشقان بێهۆش، بەتەر شەیدا بی «بێسارانی»› ≡ خاستگاه

**سەنگەسار** / sengesar/: ناو. سەنگباران؛ بەردەباران ≡ سنگسار

**سەنگەسیر** / sengesîr/: ناو. بەربەسێڵ؛ چێشتی گۆشت و ماست ‹لە لانا کەوتووە و نایێتە بیری/ کە جاران شۆرەتی بوو سەنگەسیری «هێمن»› ≡ آش گوشت و ماست

**سەنگەک** / sengek/: ناو. سەنگەکی؛ نان کوچگی؛ نانی ئەستووری درێژ و سێ‌گۆش کە لە سەر چەوی سوورەوەبوو دەبرژێ ≡ نان سنگک

**سەنگەکی** / sengekî/: ☜ **سەنگەك**

**سەنگەلا** / sengela/: ناو. سەنگەڵا؛ تاسەنگ؛ باری خوار ≡ بار کج

**سەنگەڵا** / sengeła/: ناو. ١. ☜ **سەنگەلا** ٢. کاری ڕاژان بە حەواوە ≡ ١. ☜ **سەنگەلا** ٢. نَوَسان

**سەنگەڵقۆ** / sengełqo/: ناوەڵناو. خۆتێ‌هەڵقوتێن؛ لاپرەسەن ≡ فُضول

**سەنگەڵگوان** / sengełg(i)wan/: ناوەڵناو. تایبەتمەندی گوانی ئاژەڵێک کە یەکیان لە یەکیان شۆڕتر بێ و شیری زۆرتر تێدابێ ≡ ویژگی پستان حیوانی که یکی از دیگری بزرگتر و پرشیرتر باشد

**سەنگەڵی** / sengełî/: ☜ **سەندەڵی**

**سەنگەوبەرد** / senge w berd/: ☜ **سەنگوبەرد**

**سەنگی** / sengî/: ناوەڵناو. ١. بەردین؛ کوچکی؛ لە بەرد چێکری ٢. هێژا؛ بە نرخ ≡ ١. سنگی ٢. ارزنده

**سەنگیا** / seng(i)ya/: ☜ **سەرنگا**

**سەنگیای** / seng(i)yay/: ☜ **سەنگان**

**سەنگین** / sengîn/: ناوەڵناو. ١. بەکێش؛ قورس ٢. *[مەجاز]* لەسەرخۆ؛ بەشەرم و حەیا ٣. گران؛ کەم‌ژنەو ٤. بەوەج؛ بەڕێز و بەنرخ ‹واتش بە نۆفەڵ مەر نمەزانۆ/ تەوەن نە جای ویش سەنگین مەنمانۆ «خانای قوبادی»› ≡ ١تا٣. سنگین ٤. مُعتبر

**سەنگین‌وگران** / sengîn û g(i)ran/: ناوەڵناو. لەسەرخۆ؛ بە حورمەت ≡ باوقار

**سەنگینی** / sengînî/: ناو. ١. قورسایی؛ گرانی؛ دژی سووکی ٢. شەرم و ئابڕوومەندی ≡ ١. سنگینی ٢. وقار

**سەنم** / senim/: ناوەڵناو. پیس و گلاو ≡ نجس

**سەنماندن** / senmandin/: چاوگ. گلاو کردن ≡ نجس کردن

**سەنمین** / senmîn/: چاوگ. گلاو بوون ≡ نجس شدن

**سەنن** / senin/: ☜ **سەندن**

**سەنەت** / senet/: ☜ **سەنەد**

**سەنەد** / sened/: ناو. سەنەت؛ بەڵگە؛ قەباڵە؛ نووسراوەیەکی دەسنووس یان فەرمی کە تێدا شتێک سەلماوە ≡ سند

**سەنەدۆک** / senedok/: ناو. سەمەندۆک؛ ساجووڕ ≡ ساجور

**سەنەڵ** / seneł/: ناو. سەندەڵ؛ قاپقاپ ≡ دمپایی چوبین

**سەنەڵی** / senełî/: ☜ **سەندەڵی**

**سەنیا** / senya/: ☜ **سەرنگا**

**سەنیار** / senyar/: ناو. کڕیار؛ شت‌سێن لە بازاڕ ≡ خریدار

**سەنیاگ** / senyag/: ☜ **سنیاگ**

**سەنیان** / senyan/: ☜ **سەنران**

**سەنیر** / senîr/: ☜ **سەرنگا**

▣ **سەنیری مار**: کرمێکی قەڵەوی بەڵەکە هێدی‌ـ هێدی دەخزێ ≡ نوعی کرم

**سەنیرگا** / senîrga/: ☜ **سەرانگوێلك**

**سەنیرە** / senîre/: ناو. دارێکە کاتی وێستاندنی عەڕابە، بەری دەدرێ تا کەڵ وەحەسێ ☰ ستونی که وقت استراحت حیوان گاری‌کش زیر گاری می‌گذارند

**سەنیک** / senîk/: ناو. ڕووپەڕێکی گرۆڤەری بە نەخش و دەرەجەوە (وەک: ڕووکاری سەعات و قیبلەنوما) ☰ صفحه‌ی نقشدار

**سەنین** / senîn/: ☜ **سەندن**

**سەنێر** / senêr/: ناو. سنێر؛ سەنیر؛ سەرگین؛ سەرین؛ سەوڤر؛ سەورۆ؛ سۆن؛ سوهان؛ لاس؛ تەرس؛ لاز؛ لاسک؛ ڕیخ؛ شیاکە؛ تڕۆل؛ تەردە؛ جەللە؛ چۆسلە؛ چەمین؛ پیسایی چارویان ☰ سرگین

⊡ **سەنێر پێژان**: تەپالەپێژان؛ تەپالە دروست کردن ☰ تاپاله ساختن

**سەنێرگا** / senêrga/: ☜ **سەرانگوێلك**

**سەنێروانک** / senêrwanik/: ☜ **سەرانگوێلك**

**سەنێروانگ** / senêrwanig/: ☜ **سەرانگوێلك**

**سەو** / sew/: ☜ **سەگ**[1]

**سەوا**[1] / sewa/: ناو. ١. سەودا؛ دان‌وستان؛ ئاڵش‌وێرش؛ ئاڵوویر؛ مامڵە ٢. سبەی؛ سۆزی ٣. بەرەبەیان؛ سەرەتای ڕۆژ ☰ ١. مُعامله ٢. فردا ٣. بامداد

**سەوا**[2]: ئاوەڵناو. ١. جیا؛ جودا ٢. وەک‌یەک؛ بەرامبەر ☰ ١. جدا؛ سوا ٢. مُساوی؛ برابر

**سەوا**[3]: ئامراز. بۆ خاتری؛ لەبەر؛ ژ بۆ ☰ به خاطرِ

**سەواد** / sewad/: ناو. سیوا؛ سیوات؛ سیواد؛ زانینی خوێندن و نووسین ☰ سواد

⊡ **سەواد بوونەوە** *(مەجاز)* سیواد/ سەوا بوونەوە؛ ڕوو کرانەوە؛ داهاتن و ڕاهاتن ☰ چشم و رو باز شدن

**سەوادار** / sewaddar/: ئاوەڵناو. سیوات‌دار؛ خوێندەوار ☰ باسواد

**سەوادە** / sewade/: ناو. سوادە؛ سەڵتەزەڵام ☰ پیاده‌ی تنها

**سەوادەڕێ** / sewadeřê/: ناو. پێڕەو؛ پیادەڕێ؛ پیادەڕۆ ☰ پیاده‌رو

**سەوال** / sewal/: ناو. سەواڵ؛ سەوێل؛ پاتاڵ؛ ئاژاڵ؛ گا و گۆل و مەڕ و ماڵات ☰ دام اهلی

**سەواڵ** / sewał/: ☜ **سەوال**

**سەواڵە** / sewałe/: ☜ **سواڵە**

**سەوای** / seway/: ناو. سۆزی؛ بەیانی ☰ فردا

**سەوچ** / sewç/: ناو. شیاوی؛ ژێهاتوویی ☰ لیاقت

**سەوچیان** / sewç(i)yan/: چاوگ. شیان؛ ژێهاتن ☰ شایستن

**سەوخان** / sewxan/: چاوگ. خافلان؛ گوێ ئاخنین؛ گوێ نەدان بە ئەرکی سەر شان ☰ اهمال کردن

**سەودا** / sewda/: ناو. ١. ئاڵوویر؛ دان‌وستان ٢. خولیا؛ ئیشتیا بە خەیاڵ ٣. ئەوین؛ دڵداری ٤. تەڕەبیرۆ؛ بیرۆی تەڕ ٥. یەک لە چوار هێمی سەرەکی سروشتی مرۆڤە، کە وایان دەزانی لە سپڵدا پێک دێت. (ئەوانی تر: خوێن و سەفرا و بەڵغەم) ☰ ١. سودا؛ مُعامله ٢. هَوَس ٣. عشق ۴. اگزما ۵. سودا (یکی از چهار طبع)

⊡ **سەودا کردن**: چەقە کردن؛ چەقەچەق کردن؛ بۆ ڕازی کردنی کەسێک لە سەر قبووڵ کردنی کارێک، زۆر قسە و باس کردن ‹مسیۆ! هیچ کەس نییە تەواو بە قەد و گیپالی ڕەفیقەکەت بێ؛ لە ناچاری فرۆشتمان. بەڵام بزانە لێرە سەودا کردن نییە! «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ چانه زدن

**سەوداخۆش** / sewdaxoş/: ئاوەڵناو. ١. ڕووخووش؛ ڕووگەش؛ ناوچاوڕۆشن؛ دەم‌بەپێکەنین ‹میرجە جارێک بردمیە ماڵەخۆی. خوشکێکی جوان و سەوداخۆش و دایکێکی پیری هەبوو «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. بازاڕخۆش؛ زۆرفرۆش ☰ ١. خوشرو ٢.

خوش‌مُعامله

**سەودادار** / sewdadar/: ناو. تووشیاری نەخۆشینی تەڕەبیرۆ ☰ بیمار مُبتلا به اگزما

**سەوداسەر** / sewdaser/: ئاوەڵناو. ١. دینی ئەڤین ‹لەو چۆڵ و بیابانە ئەبێ یاوەری کێ بێ؟/ یا بەو کەژوکێوانەوە سەوداسەری کێ بێ؟ «بێخود»› ٢. خەیالاوی و گێژ و ویژ ☰ ١. عاشق شیدا ٢. پریشان خیال

**سەوداگەر** / sewdager/: ناو. بازرگان؛ بازاڕوان؛ تاجر. هەروەها: **سەوداگەری** ☰ تاجر

**سەودایی** / sewdayî/: ئاوەڵناو. ١. تووشیاری نەخۆشیی سەودا ٢. *[کینایە]* هەوایی؛ شەیدا؛ گیرۆدەی ئەوینێکی شێتانە ‹شێت و شەیدای سەحرایی، دەگریم هەر وەک وەفایی/ چ بکەم لە دڵەی سەودایی؟ پەریان دەستیان لێ داوە «وەفایی»› ☰ ١. مبتلا به اگزما ٢. واله و شیدا

**سەور**[1] / sewr/: ناو. ١. سەبر؛ بینفرەهیی؛ پشوولەسەرخۆیی ٢. سنێر؛ شیاکە ٣. تاقە پژمە، کە دەڵێن نەهامەتی پێیە ☰ ١. شکیبایی ٢. سرگین ٣. صبر؛ تک عطسه

**سەور**[2]: ئاوەڵناو. ١. ساو؛ ساماڵ ٢. سەبر؛ هێواش ☰ ١. صاف ٢. آرام

**سەور**[3]: ئاوەڵکار. نەرم؛ هێواش ‹سەور بڕۆ!› ☰ آهسته

**سەورگە** / sewrge/: ☜ **سەرانگوێلك**

**سەورۆ** / sewro/: ناو. ١. سەنێر؛ ڕیخ؛ شیاکە ٢. شخڵ؛ زبڵوزاڵ ☰ ١. سرگین ٢. آشغال

**سەورۆگا** / sewroga/: ☜ **سەرانگوێلك**

**سەوز**[1] / sewz/: ناو. سەبز؛ هەوز؛ شین؛ هێشین؛ کەسک؛ زەرقی؛ ڕەنگێک لە نێوان زەرد و ئاویدا؛ ڕەنگی چیمەن یان گەڵای تازە ☰ سبز

**سەوز**[2]: ئاوەڵناو. سەبز؛ هەوز؛ شین؛ هێشین؛ کەسک؛ زەرقی: ١. بە ڕەنگی سەوز ‹پارچەی سەوز› ٢. گیاندار؛ زیندوو (بۆ گوڵ و گیا) ‹درەختی سەوز› ☰ ١و٢. سبز

⊡ **سەوز بوون**: ١. ڕوان؛ شین بوونی ڕوەک ٢. *[مەجاز]* لە نەکاو پەیدا بوون ‹لەپڕ لە سەر ڕێگام سەوز بوو› ٣. *[کینایە]* بەهرە دانی کار ☰ ١. رُستن ٢. ناگهان پیدا شدن ٣. بهره دادن کار

**سەوز کردن**: ١. ڕواندن؛ چاندن و شین بوون ٢. *[مەجاز]* پێکهێنان؛ جێبەجێ کردن ☰ ١. رویاندن ٢. انجام دادن

**سەوزاڵف** / sewzałif/: ناو. دەبار؛ ئالیک؛ وێنجە و گزرەی وشکەوەکراو بۆ زستان ☰ علف اندوختەی زمستان

**سەوزاو** / sewzaw/: ناو. نەخۆشییەکی چاوە ☰ از بیماری‌های چشم

**سەوزایی** / sewzayî/: ناو. ١. ڕەنگی سەوز ٢. گیا سەوزی دەشت و دەر ☰ ١. سبز رنگی ٢. سبزەی صحرا

**سەوزخڕ** / sewzxiř/: ناو. پێش‌فرۆش‌کڕ؛ کەسێ کە پارە بە سەلەم دەدا ☰ سَلَف‌خر

**سەوزفرۆش** / sewzf(i)roş/: ناو. کەسێ کە پارەی سەلەم وەردەگرێ ☰ سلف‌فروش

**سەوزکۆ** / sewzko/: ☜ **سەوزەکۆ**

**سەوزگیا** / sewzeg(i)ya/: ناو. چیمەن؛ چەمەن ‹سەوزگیای کارێزی پاشا مێشکی باپیری منە/ ئێستە وا فەرشە لە ژێر پێی دوژمنی خوێنخواری تۆ «قانع»› ☰ چمن

**سەوزە**[1] / sewze/: ناو. ١. سەبزە؛ شینایی دەشت و دەر ٢. مێوژە سەوزە؛ جۆرێ مێوژ ٣. ئالفی لە گیای تەڕ و سەوز ٤. ☜ **سەوزەوات** ☰ ١. سبزه ٢. کشمش سبز ٣. علف سبز ٤. ☜ **سەوزەوات**

**سەوزە**[2]: ئاوەڵناو. ١. بە ڕەنگی سپی ئاماڵزەرد ٢. سەوز و بێ‌خەوش ☰ ١. سبزه ٢. سبز خالص

**سەوزەزار** / sewzezar/: ☜ **سەوزەلاتی**

**سەوزەکۆ** / sewzeko/: ناو. سەوزکۆ؛ کاسەڵەشینکە؛ مەلێکە هەموو گیان کەسک ☰ پرندەی سبزقبا

**سەوزەلاتی** / sewzełatî/: ☜ **سەوزەلانی**

**سەوزەلان** / sewzełan/: ☜ **سەوزەلانی**

**سەوزەلانی** / sewzełanî/: ناو. سەوزەزار؛ سەوزەلان؛ سەوزەلاتی؛ سەوزەزار ☰ سبزەزار

**سەوزەڵە** / sewzełe/: ناوەڵناو. سەوزەڵێ؛ جوانی سەوزە ڕەنگی تازە پێگەیشتوو ☰ زیبای نوجوان سبزە

**سەوزەڵێ** / sewzełê/: ☜ **سەوزەڵە**

**سەوزەوات** / sewzewat/: ناو. سەوزە؛ سەوزی؛ سەبزی؛ ئەسوور؛ ئەو گیایانەی بە کاڵی دەخورێن ☰ سبزیجات

**سەوزی** / sewzî/: ناو. سەبزی: ١. سەوزە؛ گیای دەستچێن بۆ خواردن ٢. کەسک ڕەنگی ☰ ١. سبزی خوردن ٢. سبز رنگی

▣ **سەوزی پاک کردن**: لابردنی خراوە، شۆردن و ئامادە کردنی سەوزی بۆ خواردن ☰ سبزی پاک کردن

**سەوزی کردن**: سەوزی کێڵان؛ کێڵانی سەوزەوات ☰ سبزیکاری کردن

**سەوزی کێڵان**: ☜ **سەوزی کردن**

**سەوزیجات** / sewzîcat/: ناو. زەرزەوات؛ سەوزی؛ سەوزیجات ☰ سبزیجات

**سەوزیخواردن** / sewzîx(i)wardin/: ناو. هەرکام لەو سەوزانەیە بە کاڵی دەخورێن ☰ سبزیخوردن

**سەوزیفرۆشی** / sewzîf(i)roş/: ناو. ١. کاری فرۆشتنی سەوزی ٢. دووکانی سەوزی فرۆشتن ☰ ١و٢. سبزیفروشی

**سەوزیقاورمە** / sewzîqawirme/: ناو. قاورمەسەوزی؛ خۆرشتێکی لە پلەگۆشت، سەوزی جنراو و لووبیا ☰ قُرمەسبزی

**سەوزیکاڵی** / sewzîkałî/: ناو. ١. کاری کێڵان و بەرهەم هێنانی سەوزی ٢. مەزرای سەوزی خۆراکی ☰ ١. سبزیکاری ٢. مزرعەی سبزی خوردن

**سەوس** / sews/: ناو. سووچ؛ تاوان ☰ گُناه

**سەوڤر** / sewvir/: ☜ **سەنێر**

**سەوقات** / sewqat/: ناو. سۆقات؛ سلامانە؛ دیاری؛ دەسەدیاری؛ دەسایز؛ دیهاری ☰ ارمغان

**سەوقاتی** / sewqatî/: ناو. سۆقاتی: ١. شتێ کە بە دیاری دەیهێنن ٢. تریان؛ قەرتاڵەی میوە ☰ ١. سوغاتی ٢. سبد میوەچینی

**سەوک** / sewk/: ناو. ستوورک؛ کولێرە؛ نانی ئەستووری گرۆڤەر ☰ گردەنان

▣ **سەوکا مریا**: ستوورک بەخشینەوە بە خێری مردوو ☰ خوراک مراسم یادبود

**سەوگر**[1] / sewgir/: ناو. سەوگور؛ سەهگور؛ بوولێلەی بەیان؛ کازیوەی بەیانی ☰ کلّەی سحر

**سەوگر**[2]: ناوەڵناو. ئارخەیان؛ دڵنیا ☰ خاطرجمع

**سەوگراندن** / sewg(i)randin/: چاوگ. ئارخەیان/ دڵنیا کردن ☰ خاطرجمع کردن

**سەوگور** / sewgur/: ☜ **سەوگر**[1]

**سەولاندن** / sewlandin/: چاوگ. هەڵتەکاندن؛ تەتەڵە کردنی شتی وەک دانەوێڵە بۆ پاک کردنەوە لە خەوش و خاڵ ☰ روشی در بوجاری کردن غلّە

**سەولک** / sewlik/: ☜ **ئەستێولک ـ١**

**سەولە** / sewle/: ناو. سەپک؛ خەپلە؛ ئەستوورکێ لە درشتەی ئارد کە خۆراکی سەگە ☰ نوالە از نُخالە برای غذای سگ

**سەوڵ** / sewł/: ناو. ١. گوڵی پۆپەکەڵەشێرە ٢. سەلو؛ سەلوو؛ سەڵو؛ سەرو؛ ئەسرۆ؛ ئەسروو؛ سەلقی؛ ئاژەوەن؛ ئارەوەن؛ دارناژ؛ داری چواروەرز شینی گەلا زبر و چڕ بە میوەی قووچەکی و کۆتەرەی ئەستوورەوە کە تا ٢٥ و ٣٠ میتر بەرز

دەبێ ٣. ☜ سەڵپ ☰ ١. گُل تاجخروس ٢. درخت سرو ٣. ☜ سەڵپ

⊡ **سەوڵ لێدان:** پارۆ؛ ئاوژەن ‹کەلەک لارەوە بوو، ئاو هاتە سەر پشتێندمان؛ بەلام کەلەکەوان زۆر ماهیر بوو؛ وە خۆ کەوت و بە سەوڵ لێدان و لە سەر یەک ڕاستی کردەوە «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ پارو زدن

**سەوڵە** / sewłe/: ناو. خەپلە؛ کولێرەی ئەستوور ‹فاعلەکان داروجانیان دەکرێ و بە بەرد دەیانکوتا و لە سەر تەنەکەیەکی ڕەش بە ئاگری کۆنەقامیش دەیانکردە سەوڵە و دەیانخوارد، کە وەک زەهری مار تاڵ بوو «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ گردەنان ضخیم

**سەوڵەجان** / sewłecan/: ناو. گۆچان ☰ عصا

**سەونچک** / sewinçik/: ناو. بنە گیایەکی پایای پڕدڕک و چقڵە ☰ گیاهی خاردار

**سەوە** / sewe/: ناو. ١. ☜ سەوەتە ٢. گۆزە؛ جێ ئاوی لە سواڵەت ☰ ١. ☜ سەوەتە ٢. سبو

**سەوەتە** / sewete/: ناو. سەبەت؛ سەبەتە؛ سەفی؛ سەوە؛ سەوی ☰ سبد

**سەوەتەسەر** / seweteser/: ناو. جۆرێ جێنوە، بە کەسێ دەگوترێ سەری زل و دەرپەڕیوی بێ ☰ سرگُنده

**سەوەتەسەرێ** / seweteserê/: ☜ سەبەتەبەسەرێ

**سەوەڕ** / seweř/: ناو. سەگرەو؛ سەگوەڕ؛ حەپەحەپی لەسەریەکی سەگان ‹تاکوو ڕۆژ ئەو شەوە ڕۆیین بە لەوەڕ/ نە لە دز باک و نە ترسێ لە سەوەڕ «حەقیقی»› ☰ پارس گروهی سگ

**سەوەڕیخ** / seweřîx/: ناو. سەبەتەی سەنێر گوێزانەوە ☰ کلج؛ سبد پهن‌کشی

**سەوەڵ** / seweł/: ناو. قەرسیل؛ بەرماوی لەوەڕ ☰ پسماندەی چرا

**سەوی** / sewî/: ☜ سەوەتە

**سەویک** / sewîk/: ناو. ١. ئەستوورکی بە ڕۆن ٢. ☜ سەویل ـ٢ ☰ ١. گردەنان روغنی ٢. ☜ سەویل‌ـ٢

**سەویل** / sewîl/: ناو. ١. سەبیلەی توتن کێشان ٢. سەویک؛ سەویلک؛ جەڕە؛ گۆزەی ملباریک ٣. ئاوی خێرێ ☰ ١. چُپُق ٢. سبوی گردن باریک ٣. آب سبیل

**سەویلک** / sewîlik/: ☜ سەویل‌ـ٢

**سەویلە** / sewîle/: ☜ سەبیلە‌ـ١

**سەوین** / sewîn/: ناو. سەلەشیرک؛ سەبەتەی قاپ و قاجاخ ☰ سبد جای ظرف

**سەوێڵ** / sewêł/: ☜ سەواڵ

**سەه** / seh/: ناو. سەح؛ ئاگاداری ☰ آگاهی

**سەهان** / sehan/: ناو. سنێر؛ سەرین؛ ڕیخ ☰ سرگین

**سەهگور** / sehgur/: ☜ سەوگر[1]

**سەهلاب** / sehlab/: ☜ سالمە

**سەهندە** / sehinde/: ناوەڵناو. سەهەندە؛ سەهنگە؛ سەهەنە: ١. بزۆز و بێئارام ٢. ئاژاوەچی؛ شەڕخۆشکەر ‹مەی حەرامە بۆ سەهندە و بێخەمان/ مەستی بێخەم بۆچی بگرن ئێخەمان؟ «هێمن»› ٣. زرنگ؛ زیرەک ٤. سەرڕەق؛ سەرسەخت ☰ ١. ناآرام ٢. فتنەانگیز ٣. زرنگ ٤. خُشک‌سر

**سەهنگە** / sehinge/: ☜ سەهندە

**سەهو** / sehw/: ناو. سەهۆ؛ لەسەرچوو؛ نەزانست؛ هەڵە ☰ اشتباه؛ سهو

**سەهوکار** / sehwkar/: ناوەڵناو. پەرت؛ شاش؛ هەڵەکار ☰ ناشی

**سەهوڵ** / sehuł/: ☜ سەهۆڵ

**سەهوەر** / sehwer/: ناو. ١. تاریکی شەو ٢. دەواڵ؛ دێو و درنج ☰ ١. تاریکی شب ٢. جن

**سەهویر** / sehwîr/: ناو. تارمایی؛ ڕەشکەوپێشکە ☰

شَبَح

**سەهۆ** / seho/: ☜ **سەهو**

**سەهۆڵ** / sehoł/: ناو. یەخ؛ سۆڵ؛ سۆڵە؛ سەهوڵ؛ ئاوی ڕچاو ☰ یخ

◘ **بونە سەهۆڵ** ڕچان؛ ڕچیان؛ ڕەق بوون لە سەرما ☰ یخ بستن

**سەهۆڵان** / sehołan/: ناو. قوولکە ئاوێ کە سەهۆڵ دەیبەستێ ☰ یخ طبیعی

**سەهۆڵاو** / sehoław/: ناو. یەخاو؛ ئاوی تێکەڵ بە سەهۆڵ ☰ آب یخ

**سەهۆڵبەنان** / sehołbenan/: ☜ **سەهۆڵبەندان**

**سەهۆڵبەندان** / sehołbendan/: ناو. سەهۆڵبەنان؛ بەستەڵەک ☰ یخبندان

**سەهۆڵخانە** / sehołxane/: ناو. جێگەیەک کە سەهۆڵی تێدا هەڵدەگرن بۆ هاوین ☰ یخچال مصنوعی

**سەهۆڵدان** / sehołdan/: ناو. ١. ساردینگ؛ یەخچاڵ ٢. یەخدان؛ سندووقی هەڵگرتن و ڕاگرتنی یەخ و ماکی سارد ☰ ١. یخچال ٢. یخدان

**سەهەن** / sehen/: ناو. ١. سەهەند؛ سەهەنگ؛ سەهەنە؛ سێبەری خەستی دار ٢. سەحەنی نان خواردن ☰ ١. سایەی پُر درخت ٢. طَبَق نان

**سەهەند** / sehend/: ناو. ١. ☜ **سەهەن ـ١** ٢. *[کنایە]* سەرمای چەتوون ☰ ١. ☜ **سەهەن ـ١** ٢. سرمای شدید

**سەهەندە** / sehende/: ☜ **سەهندە**

**سەهەنگ** / seheng/: ☜ **سەهەن ـ١**

**سەهەنە**[١] / sehene/: ☜ **سەهەن ـ١**

**سەهەنە**[٢]: ☜ **سەهندە**

**سەهید** / sheîd/: ☜ **سەید**

**سەی** / sey/: ناو. ١. سەگ ‹سەی کوڕی سەی، داوای ڕشفەتم لێ ئەکا› ٢. ڕاو؛ شکار ٣. *[سووکەڵە]* سەیی؛ سەیید ‹سەی ئەسکەر› ٤. سێبەر ‹سەی نسارا› ☰ ١. سگ ٢. شکار ٣. سید ۴. سایه

◙ **سەی پسانگ** تووتکە سەگ ☰ تولەسگ

**سەیاح** / seyaĥ/: ناو. گەشتیار ☰ گردشگر

**سەیاحەت** / seyaĥet/: ناو. ١. گەشت؛ کاری گەڕان بۆ کەیف و دڵخۆشی ٢. گەشتیاری ☰ ١. گردش ٢. گردشگری

**سەیاد** / seyad/: ناو. ڕاوچی؛ نەچیروان ☰ صیاد

**سەیارە** / seyare/: ناو. ١. دەستەی پێشەنگی لەشکر ٢. ئوتومبێل؛ ماشین ☰ ١. دستەی پیشاهنگ لشکر ٢. خودرو

**سەیاڤ** / seyav/: ☜ **سەگاڤ**

**سەیاق** / seyaq/: ناو. ئاژۆ؛ ئاژوەر؛ ئاژوێن؛ شۆفێر ☰ رانندە

**سەیاندن** / seyandin/: چاوگ. سواخ دان؛ تێهەڵسوون ☰ اندودن

**سەیایوە** / seyaywe/: چاوگ. حەسانەوە ☰ استراحت کردن

**سەیایۆ** / seyayo/: چاوگ. حەسانەوە ☰ استراحت کردن

**سەیپەسو** / seypesû/: ☜ **سیپسو**

**سەیخۆڵ** / seyxoł/: ناو. کەڵەوە؛ پەپکە ☰ چنبرە

**سەید** / seyd/: ناو. سەیی؛ سەی؛ سێ؛ سەیید؛ سەیێد؛ سەهید؛ ئەوی لە تۆرەمەی پێغەمبەری ئیسلام بێ ☰ سیّد

**سەیدا** / seyda/: ناو. فێرکار؛ دەرزبێژ؛ مامۆستا ☰ مُدرّس

**سەیدک** / seydik/: ☜ **سەیدۆکە**

**سەیدۆکە** / seydoke/: ناو. سەرتیکە؛ سەیدک؛ سەیدووکە؛ گیایەکە بەرێکی وەک نۆک دەگرێ و بە شینی دەخورێ ☰ گیاهی با ثمری نخود مانند و خوردنی

**سەیدووکە** / seydûke/: ☜ **سەیدۆکە**

**سەیدەران** / seyderan/: ناو. گیاساج ☳ سیر زرد

**سەیدەوان** / seydewan/: ناو. ڕاوچی؛ نێچیرڤان ☳ شکارچی

**سەیر**[1] / seyr/: ناو. ١. گەشتوگێل؛ کاری گەڕان لە دەشت و دەر ٢. تماشا؛ کاری ڕوانین ‹سەیر کە چۆنی دەخوا!› ☳ ١. گشت و گذار ٢. تماشا

⊡ **سەیر کردن**: ڕوانین؛ تەمەشا کردن ☳ نگریستن

**سەیر کەسێ خۆش بون**: ١. قسەخۆش بوون ٢. هەست بە خۆشی و گەشی کردن لە تماشا کردنی کەس یان شتێ ☳ ١. کسی بذلەگو بودن ٢. از حضور کسی لذت بردن

**سەیر**[2]: ناوەڵناو. ١. سەمەر؛ عەجایب ٢. سەرنجڕاکێش ☳ ١. عجیب ٢. جالب

⊡ **سەیر مان**: سەرسووڕ مان؛ واق وڕ مان ‹چی خواستووە من بەجێی نەهێنم؟/ لێم زیز بووە، من سەیر دەمێنم «هەژار، مەم و زین»› ☳ تعجب کردن

**پێ سەیر بون**: بە لاوە سەرسووڕێنەر بوون ‹بەلام پێم سەیر بوو ئەو هەموو گولە جوانانە ... بۆنیان نەدەدا! «هەژار، چێشتی مجێور»› ☳ عجیب بودن برای کسی

**سەیرا** / seyra/: ناو. سەیرارا؛ گولێکە پشتی پەلکی سوورە و ناوەوەی سەوز و ڕەشە ☳ از گُل‌ها

**سەیرارا** / seyrara/: ☜ سەیرا

**سەیران** / seyran/: ناو. گەشت؛ هەلفۆنە؛ سەیاحەت؛ کار و ڕەوتی ڕۆشتن و گەڕان بۆ خۆشی ‹هەیاران! لە هاوینی پەنجا و شەشەوە لێرەم. چۆنە زیاد لە هەموو دەمان، ئەمڕۆ دەمبەنە سەیرانێ؟! «هەژار، چێشتی مجێور»› ☳ گردش

**سەیرانکەر** / seyranker/: ناو. گەشتیار ☳ گردشگر

**سەیرانگا** / seyranga/: ناو. سەیرانگە؛ هۆرە؛ جێگەی سەیران لێ کردن ‹جوانترم نەدی وەک بووک وەستابێ/ سەیرانگای چەمی وا پێ ئاوا بێ «گۆران»› ☳ گردشگاه

**سەیرانگە** / seyrange/: ☜ سەیرانگا

**سەیرکەر** / seyrker/: ناو. تواشاچی؛ تەماشاچی ☳ تماشاچی

**سەیرگە** / seyrge/: ناو. شوێنی لێڕوانین ☳ منظر

**سەیروسەمەرە** / seyr û semere/: ناوەڵناو. بەلاجەوی؛ ئەلاجەوی ☳ عجیب و غریب

**سەیرە** / seyre/: ناو. زەنگۆلەمیرە؛ دەستە باڵندەیەکن، پەڕ و باڵیان ڕەنگاوڕەنگە، دانە دەخۆن، نێر و مێیان یەک ڕەنگن، کلکیان ڕەش و سپیی و سیمایان سوورە ☳ سُهره

**سەیز** / seyz/: ناو. خزمەتکاری ئەسپ؛ مەیتەر ☳ مهتر

**سەیزادە** / seyzade/: ناو. ١. کچە سەید؛ ژنێ کە لە نەتەوەی سەید بێ ٢. *[کینایە]* کچە نەجیمزادە ☳ ١. سیّده ٢. دختر نجیب‌زاده

**سەیزان** / seyzan/: ناو. ئۆدەی ژێر زەمین ☳ اتاق زیرزمینی

**سەیس** / seys/: ناو. کوور؛ بەچکەبزنی نێری دووساڵە ☳ بُزغالەی نر دو سالە

**سەیشت** / seyşt/: ناو. ترس؛ خۆف ☳ ترس

**سەیڤان** / seyvan/: ناو. ١. ڕاوکەر؛ نچیرڤان ٢. ☜ سەیوان ☳ ١. شکارچی ٢. ☜ سەیوان

**سەینای** / seynay/: ☜ سانەوە

**سەین‌وبەین** / seyn û beyn/: ناو. کەین‌وبەین؛ کاکەوبراڵە ☳ تبانی

**سەیوان** / seywan/: ناو. سەیڤان؛ سەیوانە: ١. سابات ‹داخوم جە تەنخوای دووی سفتەکەی وێت/ چێش بۆ وە سەیوان شەو تا ڕۆ پەرێت؟ «مەولەوی»› ٢. خەرمانەی مانگ ☳ ١. سایبان ٢. هالەی ماه

**سەیوانە** / seywane/: ☜ سەیوان

**سەیوەت** / seywet/: ناو. سەبر؛ تاقەت ☳ صبر

**سەیی** / seyî/: ☜ **سەید**

**سەیید** / seyîd/: ☜ **سەید**

**سەیێد** / seyêd/: ☜ **سەید**

**سە** / sih/: ئاوەڵناو. ١. سڵ؛ قوشقی ٢. دڵئێشاو؛ ڕەنجاو ☰ ١. رموک ٢. آزُرده

**سهر**[1] / sihr/: ئاوەڵناو. ١. زڕ؛ بەدەڵ ٢. بێبەر؛ بەرنەدەر ☰ ١. بدل ٢. بی‌ثمر

**سهر ـ**[2]: پێشوشە. زڕ ‹سهرداک› ☰ نا ـ

**سهرک**[1] / sihrik/: ناو. قوتکەی سەر لوولەی تفەنگ ☰ مگسک تُفنگ

**سهرک**[2]: ئاوەڵناو. زڕ؛ سهر؛ بەدەڵ ☰ بَدَل

**سهک** / sihik/: ☜ **سرکە ـ٢**

**سهنتی** / sihintî/: ناو. شەقەزیلە؛ عیشت؛ شەپازللە ☰ سیلی

**سهنە** / sihne/: ناو. تارمایی؛ ڕەشایی نەناسراو لە دوور ☰ شبح

**سهۆری** / s(i)horî/: ☜ **سمۆرە ـ١**

**سی**[1] / sî/: ناو. ١. سەهی؛ سپەلاک؛ سپەلک؛ سەپەلیک؛ سێپەلاک؛ شی؛ شیشار؛ شۆشی؛ شمش؛ پیلاسپی؛ سووێ؛ سوویە؛ پوف؛ وەرێشک؛ پشاسپی؛ جەرگی سپی؛ ئەندامی هەناسە دان لە دەروونەدا ‹نەخۆشی سی› ٢. هیرس؛ هیەرس؛ ژمارەی سەرەکی دوای بیست و نۆ، بەر لە سی و یەک ٣. سیل؛ دەردەباریکە ٤. خاسەسی؛ باڵدارێکی کۆچەرە لە تیرەی قازەکان، نزیک ٧٥ تا ٨٥ سانتی‌میتر دەبێ، لە ناو قامیش و جەگەندا هێلانە ساز دەکا ٥. ڕەش؛ سیا ☰ ١. شُش ٢. عدد سی ٣. بیماری سل ۴. غاز خاکستری ۵. سیاه

⊡ **سی با کردن**: ☜ **سی ماسین**

**سی پەنەمیان**: ☜ **سی ماسین**

**سی ماسین**: *[کنایه]* سی با کردن؛ سی پەنەمیان؛ لە داخان و حەیفان جارِز بوون ☰ حرص و جوش خوردن

**سی**[2]: ئاوەڵناو. ١. دانەیەک زۆرتر لە بیست و نۆ دانە ٢. سیهەمین؛ سیەمین؛ سیومین ☰ ١. سی ٢. سی‌اُم

**سی**[3]: ئامراز. سەبا؛ سەوا؛ لەبەر ‹سی تۆ› ☰ برایِ؛ بە خاطرِ

**سیا**[1] / s(i)ya/: ناو. سیاو؛ سیاوە؛ سییە؛ سیە؛ ڕەش؛ بەرانبەری سپی ☰ سیاه

**سیا**[2]: ئاوەڵناو. سییە؛ سیە؛ بە ڕەنگی ڕەش ☰ سیاەرنگ

**سیا ـ**[3]: پێشوشە. سییە ـ؛ سیە ـ؛ ڕەش ‹سیاچارە؛ سیامال؛ سیاسال› ☰ سیاه ـ

**ـ سیا**[4]: پاشەوشە. ـ ڕەش ‹ڕووسیا› ☰ سیاه

**سیابو** / s(i)yabû/: ناو. گیایەکە دەکرێتە ناو ژاژی ☰ گیاهی که با شیراز می‌آمیزند

**سیابەخت** / s(i)yabext/: ئاوەڵناو. چفتە؛ بەدبەخت ‹سا خاسەن ئیمجار شووم سیابەخت/ تۆ ئالوودەی دەرد من زامان سەخت «مەولەوی»› ☰ بدبخت

**سیاپورسینک** / s(i)yapursînik/: ☜ **سیاپورسینگ**

**سیاپورسینگ** / s(i)yapursîng/: ناو. سیاپوسینگ؛ سیاپورسینک؛ سیبەپرووسنەک؛ سیپریسک؛ سێپریسک؛ سێپرووسنەک؛ پەڕەسلێرکە؛ پەڕەسیلکە ☰ پرستو

**سیاپوسینگ** / s(i)yapusîng/: ☜ **سیاپورسینگ**

**سیاپۆس** / s(i)yapos/: ئاوەڵناو. ڕەش‌پێست؛ یەکێ لە چوار تۆرەمەی گەورەی مرۆ لە سەر زەوی ☰ سیاەپوست

**سیاپۆش** / s(i)yapoş/: ناو. ڕەش‌دەرمان؛ گیای سیاوپووژ ☰ پرسیاوشان سیاه

**سیاپێست** / s(i)yapêst/: ئاوەڵناو. سیاپۆس؛ ڕەش‌پێست ☰ سیاهپوست

**سیاتاڵە** / s(i)yatałe/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **سیاتۆمە** ٢. بەدبەخت ☰ ١. ☜ **سیاتۆمە** ٢. سیەبخت

**سیاتگ** / s(i)yatig/: ناو. دووکەڵ ☰ دود

**سیاتۆمە** / s(i)yatome/: ئاوەڵناو. سیاچەردە؛ سیاتۆوە؛ سیاتاڵە؛ ڕەشتاڵە؛ ڕەشکەڵە ☰ سیەچردە

**سیاتۆوە** / s(i)yatowe/: ☜ سیاتۆمە

**سیاتیک** / s(i)yatik/: ناو. ڕەهێش: ۱. دەماری هەست و جوولەی پێ ۲. نەخۆشییەکی گرانە کە بە هۆی هەو کردن یان قرنجانی دەماری ڕەهێشەوە بەدی دێ و پتر لە پشتێنەوە بۆ پشت ڕان و ئەژنۆ چڵ دەوشێنێ ☰ ۱. عصب سیاتیک ۲. بیماری سیاتیک

**سیاچادر** / s(i)yaçadir/: ☜ سیاماڵ

**سیاچارە** / s(i)yaçare/: ئاوڵناو. بەختڕەش؛ سیاتاڵە؛ بەدبەخت ☰ سیەبخت

**سیاچاڵ** / s(i)yaçał/: ناو. ژێرخانێکی تەسک و تەڕ و ترووک کە یەخسیریان بۆ سزا تێدا ڕادەگرت ☰ سیاەچال

**سیاچاوە** / s(i)yaçawe/: ناو. گیاقاولەمە؛ خەربەند؛ ڕوەکێکە لە تیرەی هەلالان، بە ڕیشەی باریک، لاسکی چەماوە و گەلای درێژ و پەڕەگوڵی ڕێکوپێکی سوورەوە، کە لە کۆتایی زستان یان سەرەتای بەهاردا دەپشکوێت ☰ خربق

**سیاچەردە** / s(i)yaçerde/: ☜ سیاتۆمە

**سیاچەمانە** / s(i)yaçemane/: ناو. شێوە مەقامێکی تایبەتە لە مووسیقای هەوراماندا ☰ سبکی ویژە در موسیقی مقامی اورامان

**سیاحەت** / s(i)yaĥet/: ناو. سەیران؛ گەشتیاری ☰ گردشگری

**سیار**[1] / s(i)yar/: ناو. ۱. ئاریکار؛ هاوکار ۲. سوپار؛ سوار ۳. شاگرد؛ بەردەستی پیشەساز ٤. جگەرە؛ سگار ‹سیار مەکێشە دوید سیار تاڵە/ سیار خەمدەرکەر گەدا و بێماڵە «فولکلۆر»› ٥. تارمایی؛ تاپۆ ☰ ۱. یار و یاور ۲. سوار ۳. شاگرد ۴. سیگار ۵. شبَح

**سیار**[2]: ئاوەڵناو. ۱. نەخۆش بە دەردی سی ۲. سوار ☰ ۱. بیمار مسلول ۲. سوار

**سیارک** / s(i)yar(i)k/: ☜ سیسارگ

**سیارە**[1] / s(i)yare/: ناو. ۱. سوارە؛ دەستەی سواران ۲. جۆرێ گەنم ۳. باڵی سەری چوارچێوە کە دەچێتە ناو دیوار ☰ ۱. دستەی سواران ۲. نوعی گندم ۳. زیادی چهارچوب کە در دیوار قرار می‌گیرد

**سیارە**[2]: ئاوەڵکار. بە سواری ☰ سوارە

**سیاری** / s(i)yarî/: ئاوەڵناو. سیگاری؛ سگاری؛ جگەرەکێش ☰ سیگاری

**سیارۆ** / s(i)yařo/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* بەختڕەش؛ بەدبەخت ☰ سیەروز

**سیازاخ** / s(i)yazax/: ناو. ۱. جۆرێ زاخی ڕەش ۲. گیایەکە کەمتەمەن ۳. ☜ **سیازام** ☰ ۱. زاج سیاە ۲. گیاهی است ۳. ☜ **سیازام**

**سیازام** / s(i)yazam/: ناو. سیازاخ؛ تیراوێ؛ لاڕەشە؛ ڕەشەکەوتە؛ ڕەشەبرین؛ ڕەشەزام؛ برینارەش؛ قەرەقوش؛ نەخۆشی چلکی هاوبەشی مرۆڤ و ئاژەڵ کە بە شێوەی کوانێکی چلکی ناوڕەش سەر هەڵدەدا ☰ سیاەزخم

**سیازدە** / s(i)yazde/: ☜ سیانزە

**سیازدەمین** / s(i)yazdemîn/: ☜ سیازدەهەمین

**سیازدەهەمین** / s(i)yazdehemîn/: ئاوەڵناو. سیازدەهەمین؛ سیانزەمین؛ سیازدەمین؛ سیانزەهەمین؛ سێزدەمین؛ سێزدەهەمین؛ بە پلە، ڕیز یان جێگەی سێزدەهەمەوە ☰ سیزدهم

**سیازوخاڵ** / s(i)yazuxał/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* ڕەشی زۆر ڕەش ☰ سیاەِ سیاە

**سیازەندۆق** / s(i)yazendoq/: ئاوەڵناو. زۆر لاوازی ڕەشهەڵگەڕاو ☰ سیەچردەی لاغرمُردنی

**سیاساڵ** / s(i)yasał/: ناو. *[مەجاز]* وشکەساڵ؛ ڕەشەساڵ؛ ساڵی بێباران ‹لە چاوا نم نەما بۆ گریە، نۆبەیَ سەجدە بەر دەرییە/ سیاساڵم نەبارە، نوێژی

ئیستیسقا نەکەم چ بکەم؟ «مەحوی»› 🇮🇷 خشکسال

**سیاسوت** / s(i)yasût/: نـاو. ڕاوەکـەوی هەوەڵـی بەهار 🇮🇷 شکار کبک در آغاز بهار

**سیاسەت** / s(i)yaset/: نـاو. ڕامیـاری: ۱. زانسـتی دەسەڵاتداری ۲. کار و باری سـەر بـە پێوەنـدی دەوڵەتێک لەگەڵ دەوڵەتانی تـردا ۳. کۆمەڵـەی ڕێچار و ڕەوشی دەوڵەت یان کەسێک بۆ بـەڕێوە بردنی کار و باری 🇮🇷 ۱تا۳. سیاست

**سیاسەتزان** / s(i)yasetzan/: ئاوەڵـناو. سیاسەتڤان: ۱. ئاگـا و ئاشـنا بـە چۆنیـەتی و شـێوەگەلی هەڵسوکـەوت و پەیوەنـدی نێـوان دەوڵـەتان و حیـزب و تاقمگـەلی نـاو کۆمـەڵگا ۲. فـرەزان؛ سەگفزوول 🇮🇷 ۱. سیاستمدار ۲. رند

**سیاسـەنگ**[1] / s(i)yaseng/: نـاو. کوچکەڕەشـــە 🇮🇷 سنگ سیاه

**سیاسـەنگ**[2]: ئاوەڵـناو. *[کینایـە]* بـێبـەزە؛ دڵـڕەق ‹موتریب یە کارەن مەر سیاسەنگی/ من وەی حاڵەوە تۆ وەی بێدەنگی! «مەولەوی»› 🇮🇷 سنگدل

**سیاسی** / s(i)yasî/: ئاوەڵـناو. ڕامیـاری؛ پێوەندیـدار یان هاوگەری سیاسەت 🇮🇷 سیاسی

**سیاکام** / s(i)yakam/: نـاو. جـۆرێ ڕاوە کـەوە: کـەوێک دەخەنـە قەفـەس و داوی بـە دەوردا دەنێنـەوە، کـەوی قەفـەس دەخوێنـێ و کەوەکانیتر بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ و بە تەڵەوە دەبن 🇮🇷 نوعی شکار کبک

**سیاگۆش** / s(i)yagoş/: ناو. پیشلە کێوی؛ وشـەک؛ ورشەک؛ گیانداریکی ڕاوکەر لە تـیرەی پشـیلەیە بە پێی درێژ، کلکی کـورت، گـوێ مەندۆڵـەیی و پێستی قاوەیی ئامال سوورەوە 🇮🇷 سیاەگوش

**سیالەک** / s(i)yalek/: ☜ **سیسارگ**

**سیامار** / s(i)yamar/: ناو. ڕەشەمار 🇮🇷 مار سیاه

**سیامال** / s(i)yamał/: نـاو. سـیاچادر؛ ڕەشمـاڵ؛ ڕەشمـار؛ ڕکەوەنـدە؛ تـاوڵ؛ کـۆن؛ دەوار؛ دەواو؛ دوار؛ خێوەتی ڕەشی لە موو چنراوی خێڵەکییان ‹گۆشـەی سـیامال هـۆردا دیـاوە/ چـوون مانـگ نـە گۆشەی هەوری سیاوە «مەولەوی»› 🇮🇷 سیاەچادر

**سیان**[1] / s(i)yan/: ناو. ۱. قـورم؛ دوودە؛ دووکەڵـی لە دیوار و دەفر نیشتوو ۲. سێ ژمارە ‹دانێ، دوان، سیان، چوار› 🇮🇷 ۱. دوده ۲. سه عدد

**سیان**[2]: جێناو. سێ دانە ‹دانێ هات و سیان چوو› 🇮🇷 سه تا

**سیانزە**[1] / s(i)yanze/: ناو. سیازدە؛ سێزدە؛ سـێزە؛ سێنـزە؛ ژمارەی سـەرەکی دوای دوازدە و پـێش چواردە 🇮🇷 سیزده

⊡ **سیانزە دەرکردن:** چوونە دەرەوە بۆ سـەیران لـە ڕۆژی ۱۳ی خاکـەلێوە و بـەجێهێنـانی ڕێوڕەسمی تایبەتی ئەو ڕۆژە 🇮🇷 آیین سیزده بجا آوردن

**سیانزە**[2]: ئاوەڵـناو. سیازدە؛ سێزدە؛ سێزە؛ سێنـزە: ۱. دانەیـەک زیـاتر لـە دوازدە دانـە ۲. *[مـەجاز؛ سـەرزارەکی]* بەدودم؛ قۆشە؛ نەحس 🇮🇷 ۱. سیزده ۲. شوم

⊡ **لـە سیانزە نـەحستر:** *[مـەجاز]* زۆر نـەحس و بەدفەڕ 🇮🇷 بدیُمن

**سیانزەمین** / s(i)yanzemîn/: ☜ **سیازدەهەمین**

**سیانزەوەدەر** / s(i)yanzeweder/: ☜ **سێزدەبەدەر**

**سیانزەهەم** / s(i)yanzehem/: ئاوەڵناو. سیانزەمین؛ بە ڕیز یان پلەی سێزدەهەمەوە 🇮🇷 سیزدهُم

**سیانزەهەمین** / s(i)yanzehemîn/: ☜ **سیازدەهەمین**

**سیانکە** / s(i)yanke/: ناو. قوڕ و لیتە 🇮🇷 گل‌ولای

**سیانور** / s(i)yanûr/: نـاو. مـاکی کیمیـایی زۆر ژاراوی کە بۆ دەرمانی جـڕ و جانـەوەر، ئاوکـاری کارەبایی و دەرکێشانی زێڕ و زێو بە کار دێـت 🇮🇷 سیانور

**سیانە** / s(i)yane/: ناوەڵناو. سێیینە؛ سێ دانە پێکەوە ‹پشیلەکەمان سیانەی دیوە!› ▤ سەقلو

**سیانهۆ** / s(i)yanho/: ناو. گیایەکە ▤ گیاهی است

**سیانی** / s(i)yanî/: ناوەڵناو. سێبەسێ ▤ سەتایی

**سیاو** / s(i)yaw/: ☜ سیا[1]

**سیاوا** / s(i)yawa/: ☜ ڕەشەبا

**سیاوپووزە** / s(i)yawpûze/: ناو. گیایەکە لە ئاودا دەڕوێ ▤ گیاهی آبزی

**سیاوپووس** / s(i)yawpûs/: ناو. گیایەکە لە ئاودا دەڕوێبۆ دەرمان دەشێ ▤ پرسیاوشان

**سیاوسەدە** / s(i)yawsede/: ناو. گوڵی سمڵ ▤ سُنبل

**سیاوقەڵاو** / s(i)yawqeław/: ناو. قەلەڕەش؛ قالاخ؛ قژکاڕەش ▤ کلاغ سیاه

**سیاوڵە** / s(i)yałe/: ناو. ڕەشکە: ١. گیایەکی یەکساڵەی تەڕەکاڵییە بۆ تۆوەکەی دەچێندرێ ٢. تۆمی ڕەشی ئەو گیایە کە دەخورێ و بۆ دەرمانیش دەبێ ▤ ١و٢. سیاەدانە

**سیاون** / s(i)yawin/: ☜ سیاونە

**سیاونە** / s(i)yawne/: ناو. سیاون: ١. ڕەشانگ؛ بزنە موو ٢. گۆشتی بزنە موو ٣. چەورێ کە بە ناو دەمەوە بنووسێ ▤ ١. بُز مویین ٢. گوشت بُز مویین ٣. چربی کە بە کام چسبد

**سیاوە** / s(i)yawe/: ☜ سیا[1]

**سیاهە** / s(i)yahe/: ☜ سیاهی

**سیاهی** / s(i)yahî/: ناو. سیاهە؛ سیایی؛ سیای؛ لیستە؛ نامە یان دەفتەرێ کە ناو، ژمارە یان چەنێتی ئەندامانی کۆمەڵێکی تێدا نووسراوە ▤ لیست؛ سیاهە

**سیای** / s(i)yay/: ☜ سیاهی

**سیایەوە** / s(i)yayewe/: ☜ سانەوە

**سیایی** / s(i)yayî/: ☜ سیاهی

**سیبا** / sîba/: ناو. سیبات؛ سابات ▤ سایەبان

**سیبات** / sîbat/: ☜ سیبا

**سیبری** / sîb(i)rî/: ناو. ئەزوا ▤ الو

**سیپ** / sîp/: ناو. ١. دەستەندوو؛ دەسەکەوشە ٢. هێز و توانی زۆر ٣. تامان لە چەم بۆ ماسی گرتن ٤. ڕەبەت؛ سیپە؛ بەرگە ٥. سەندووقی میوە ▤ ١. دستگیرەی خیش ٢. نیروی زیاد ٣. دیوار ترکەای در رود، برای صید ماهی ۴. کمینگاه شکارچی ۵. صندوق میوە

**سیپارە** / sîpare/: ناو. جزم؛ پاژێ لە سی پاژی قورعان ‹لەو ڕۆژەوە دەبوو سیپارە لە بن هەنگڵدا بچم تا نیوەڕۆ لە قوتابخانە بم و دوای نیوەڕۆ بەرهەڵدای کوڵان و سەرگەرمی گەمە و کایە بم! «هەژار، چێشتی مجێور»› ▤ یک جزء از سی جزء قرآن

**سیپاڵ**[1] / sîpał/: ناو. [پەلاز] ١. جلک؛ بەرگ و کەلوپەلی مرۆ ‹بەوپەڕی ناهومێدییەوە چووم لە وشتەپە کتێب و سیپاڵەکەم هێنایەوە و مۆرم بە دەرگای خوێندن و فەقێیەتییەوە نا! «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. کۆنەپەڕۆ؛ پەڕۆی دڕاو ٣. بەڕەی ساکار و کەمبەر ▤ ١. جل‌وپلاس ٢. کُهنەپارە ٣. گلیم سادە و کم‌عرض

⊡ **سیپاڵ بە زەویدا دان**: [کینایە] بۆی کەوتن؛ پاڵ لێ دانەوە (زۆرتر بە ناچاری) ‹جارێکی‌تر هاتمەوە و سیپاڵم لە خانەقا بە زەویدا دا «هەژار، چێشتی مجێور»› ▤ کنگر خوردن و لنگر انداختن

**سیپاڵ**[2]: پێرۆ. ← سروسیپاڵ

**سیپاڵبەڕۆن** / sîpałbeřon/: ناو. هەویری دە ناو ڕۆن و دۆشاودا سوورەوەکراو ▤ چنگالە؛ خمیر در شیرە و روغن سرخ شدە

**سیپاڵبەکۆڵ** / sîpałbekoł/: ناو. [کینایە] دۆڵمەی پەلکەمێو ▤ دُلمەی برگ مو

**سیپاڵشۆر** / sîpałşor/: ناو. جلکشۆر ▤ رختشو

**سیپان** / sîpan/: ناو. ١. بلندایی باگێرەوە ٢. کێوی

پڕ لە بەفر لە هەموو دەماندا ٣. شاپە؛ ڕنوو؛ هەرەس ≡ ١. بلندی مانع باد ٢. کوهی که در همه ایام برف داشته باشد ٣. بهمن

**سیپریسک / sîprîsk/**: ☜ **سیاپۆرسینگ**

**سیپسوو / sipsû/**: ناو. سەیپەسوو: ١. دارێکی گەرمەسێرە بە گەڵای بێ‌کوڵکی هێلکەیی، گوڵی سپی یان زەرد و بەری پێشەدارەوە ٢. بەری ئەو دارە کە ئەوەندەی گیلاسێکە و بۆ دەرمان دەشێ ≡ ١و٢. سپستان

**سیپک / sîpik/**: ناو. ١. سێ‌پای مەشکە ٢. سێ‌پایەی ئاگردان ≡ ١. سەپایەی مشک ٢. سەپایەی اُجاق

**سیپۆ / sîpo/**: ناو. پۆپەڕەشە ≡ طاعون مُرغ

**سیپە / sîpe/**: ناو. ١. سیپ؛ ڕەبەت؛ بۆسەی ڕاوکەر ‹بنە ڕووخان و سیپە چۆڵ و هۆڵن/ بڵاون ڕاوکەر و باڵندە پۆلن «هێمن»› ٢. سێرەی تفەنگ ٣. هەڕەتی لاوەتی ≡ ١. کمین شکارچی ٢. مگسک تُفنگ ٣. عُنفوان جوانی

**سیپەرە / sîpere/**: ☜ **سیپەلە**

**سیپەکووڕ / sîpekûř/**: ناو. جۆرێ تفەنگ ≡ نوعی تفنگ

**سیپەل / sîpel/**: ناو. پێل؛ شەپۆل ≡ موج

**سیپەلاک / sîpelak/**: ☜ **سی**[1]

**سیپەلک / sîpelik/**: ☜ **سی**[1]

**سیپەلۆک / sîpelok/**: ناو. زارۆی نێوان حەوت تا نۆ ساڵانە ≡ کودک هفت تا نُه ساله

**سیپەلە / sîpele/**: ناو. سیپەرە؛ باوەشێنە؛ نێرووک؛ سەفرابەر؛ گوڵداروو؛ کەروەزەکێویلە؛ بارپیرە؛ منالەڕەش؛ قژی‌کچ؛ قژ کەنیشک؛ پەلی سیاوەشان؛ ڕیشی پیرەمەڕانە؛ گیایێکی پایا، بە پارچە گەڵای بێ‌ددانەوە کە لە ژێرەوە خاڵی وردی بریقەداری زەردی هەیە ≡ سرخس

**سیت / sît/**: ناو. ١. ☜ **سیتە** ٢. *[کینایە، شوورەیی]* شەرمی ژن ٣. لەقەمە بۆ ژنان ≡ ١. ☜ **سیتە** ٢. شرمگاه زن ٣. لقبی برای زنان

**سیتاڤ / sîtav/**: ناو. تافگە؛ تاڤگە ≡ آبشار

**سیتاڤک / sîtavik/**: ناو. ١. سێتاڤ؛ سایەی مرۆ لە بەر خۆر ٢. تاڤگە ≡ ١. سایەی انسان در آفتاب ٢. آبشار

**سیتبلۆق / sîtb(i)loq/**: ناوەڵناو. *[پلار، شوورەیی]* حەشەری؛ بەئیشتیا بۆ سەرجێیی (ژن) ≡ حشری (زن)

**سیتر / sîtir/**: ناو. کونار؛ کەنار؛ تەعەو؛ سیدرە ≡ کُنار

**سیتک / sîtik/**: ☜ **سیتەك**

**سیتکەزەلام / sîtkezelam/**: ☜ **سیتکەسەلام**

**سیتکەسلاو / sîtkes(i)ław/**: ☜ **سیتکەسەلام**

**سیتکەسلاوە / sîtkes(i)ławe/**: ☜ **سیتکەسەلام**

**سیتکەسەلام / sîtkeselam/**: ناو. سیتکەزەلام؛ سیتکەسلاو؛ سیتکەسلاوە؛ سیچکەسلاو؛ سیچکەسلاوە؛ سیچەسلاوە؛ سینچکەسلاو؛ زیپکەی بە چلک لە پێڵووی چاودا ≡ گُل‌مُژه

**سیتل / sîtil/**: ناو. ١. مەنجەڵ؛ بەرۆش ٢. سەتڵە؛ سەتڵ ≡ ١. دیگ مسی ٢. سطل

◙ **سیتلی سماق**: پیازی سماق لێ دراو ≡ پیاز سُماق‌زده

**سیتە / sîte/**: ناو. سیت؛ تەپکە؛ داوی لە تەختە کوتراو بۆ ڕاوی مەل ≡ نوعی دام

**سیتەک / sîtek/**: ناو. سیتک؛ بەردەلان ≡ سنگلاخ

**سی‌تی‌سکەن / sîtîsken/**: ناو. شێوەیەکی وێنە هەڵگرتن لە ئەندامانی ناوەوەی لەش، کە لە چەن لاوە لەش دەخەنە بەر تیشکی ئیکس و پاشان کەمپیوتەر، وێنەی برگەیەکی لێ ساخ دەکاتەوە ≡ سی‌تی‌اسکن

**سیچڕ / sîçiř/**: ☜ **سووچەڕ**

**سیچڕە / sîç(i)ře/**: ناو. پەڕشەخۆرە؛ پەڕشخۆرکە؛

جۆرێ چۆلەکەی کێوی، بە قەد پاساری دەبێ ☰ نوعی گنجشک کوهی

**سیچقە / sîçqe/:** ↓

**سیچقە دەرکردن:** مووی لەش لە سەرمان ڕاست بوونەوە ☰ موی بر تن سیخ شدن از سرما

**سیچک / sîçik/:** ناو. ١. جۆرێ بەری دارمازوو ٢. گیایەکی پایای دڕکاوییە ☰ ١. بزغند؛ نوعی ثمر مازوج ٢. گیاهی پایا و پُرخار

**سیچکە / sîçke/:** ناو. ١. سیچک؛ بەرێکی دارمازو ٢. پۆخ؛ خونچەی تازەی دار ٣. بەرەسماق ☰ ١. بزغند؛ نوعی ثمر مازوج ٢. اولین غُنچەی درخت ٣. تُرشک

**سیچکەسڵاو / sîçkes(i)ław/:** ☜ سیتکەسەلام

**سیچکەسڵاوە / sîçkes(i)ławe/:** ☜ سیتکەسەلام

**سیچکی / sîçkî/:** ناو. ترشۆکە؛ ترشکە؛ ترشۆک ☰ تُرشَک

**سی‌چە / sîçe/:** ئامراز. بۆچی؛ لەبەرچی ☰ چرا

**سیچەڕ / sîçeř/:** ☜ سوچەڕ

**سیچەسڵاوە / sîçes(i)ławe/:** ☜ سیتکەسەلام

**سیچەن / sîçen/:** ناو. ئۆقرە؛ ئارام ☰ آرامش

⊡ **سیچەن گرتن:** ئۆقرە گرتن؛ داسەکنان ‹یەکجار هاروهاجە، لە هیچ شوێنێ سیچەن ناگرێ› ☰ آرام گرفتن

**سیحر / sîĥr/:** ناو. ئەفسوون؛ جادوو ☰ سحر

**سیحرئاسا / sîĥr'asa/:** ئاوەڵناو. وەک سیحر ☰ سحرآسا

**سیحراوی / sîĥrawî/:** ئاوەڵناو. ئەفسووناوی؛ تەلسماوی؛ تێکەڵاو بە سیحر و جادوو ☰ سحرآمیز

**سیحرباز / sîĥrbaz/:** ناو. ١. ئەفسوونکار؛ جادووگەر ٢. *[کینایە]* ژنی بە مەکر و فێل ☰ ١. ساحر؛ جادوگر ٢. زن مکار

**سیحربازی / sîĥrbazî/:** ناو. جادووگەری؛ ئەفسوونکاری ☰ جادوگری

**سیخ[1] / sîx/:** ناو. ١. زەرگ ٢. سێخ؛ شیش ٣. ☜ سوخ ☰ ١. سیخ درویشان ٢. سیخ ٣. ☜ سوخ

⊡ **سیخ دان:** *[کینایە، پلار]* دنەدان؛ هانەدان ☰ تحریک کردن

**سیخ[2]:** ئاوەڵناو. ڕاست؛ نە خوار ☰ سیخ

**سیخاخن / sîxaxin/:** ناو. سیخناخ؛ کاری بە زەبری شیش پڕکران؛ توند ئاخندران ☰ عمل با فشار سیخ آگندن

**سیخار / sîxar/:** ☜ سوخ

**سیخاسە / sîxase/:** ناو. سی؛ خاسەسی؛ قازی دەشتی ☰ غاز خاکستری

**سیخاندن / sîxandin/:** چاوگ. ١. بە زۆر تێڕا کردن ٢. خشەخش کردنی سینە؛ دەنگ لە سنگەوە هاتن ☰ ١. فرو کردن ٢. خس ـ خس کردن سینه

**سیخپەڕ / sîxpeř/:** ناو. جووچکەمەلی تازە پەڕ دەرکردوو ☰ جوجەی تازە پردرآورده

**سیخچوولە / sîxçûle/:** ناو. جۆرێ ژیشکی زەلام ☰ سیخول؛ نوعی خارپُشت درشت

**سیخک / sîxik/:** ناو. قەڵەمە؛ تووڵی سەرداداو بۆ چەقاندن ☰ قلمه

**سیخمە / sîxme/:** ☜ سوخمە ـ١

**سیخن / sîxin/:** ئاوەڵناو. *[پلار]* سیخنە؛ لاواز؛ لەجەر؛ داڵگۆشتی بێ‌هێز ☰ لاغرمُردنی

**سیخناخ / sîxnax/:** ☜ سیخاخن

**سیخنە / sîxne/:** ☜ سیخن

**سیخوار / sîx(i)war/:** ناو. ١. سەرماوەز؛ سێهەم مانگی پاییز ٢. زوقم؛ ئالشت ☰ ١. آذرماه ٢. پژ؛ سرماریزه

**سیخوارلەپشت / sîx(i)warlepişt/:** ئاوەڵناو. تایبەتمەندی کەروێشک لە پاییزان کە لە بەر

قەڵەوی ناتوانێ باز بدا، خۆی لە ڕاوچی و تاژی حەشار دەدا و سیخوار لە سەر پشتی دەنیشێ ‹ئەوا کەروێشکەکەی سیخوارلەپشتە/ قولەشینی بەهەست و گورج و گشتە «هێمن»› ☰ ویژگی خرگوش چاق پاییزی

**سیخور** / sîxur/: ☜ **سووچەڕ**

**سیخورمە** / sîxurme/: ناو. ١. ☜ **سخورمە** ٢. دنە و هانە ٣. کاری دار تێ ڕاکردن ☰ ١. ☜ **سخورمە** ٢. تشجیع ٣. عمل چوب فرو کردن (در چیزی)

**سیخوڕ**[١] / sîxuř/: ناو. ١. سیخچوولە؛ جۆرێ ژیشکی زەلام ٢. پەڵخوڕ؛ لەوەڕی ناو ورگی حەیوان کە هێشتا هەزم نەبووە ☰ ١. سیخول؛ نوعی خارپُشت دُرُشت ٢. علف نشخوار نشده

**سیخوڕ**[٢]: ناوەڵناو. سۆزمانی؛ هەواڵدز؛ جاسووس ☰ جاسوس

**سیخوڕمە** / sîxuřme/: ناو. مستەکۆڵە ☰ سقُلمبە

**سیخوڕی** / sîxuři/: ناو. شۆفاری؛ هەواڵدزی ☰ جاسوسی

**سیخە** / sîxe/: دەنگەناو. خشەی سنگ لە کاتی توند هەناسە داندا ☰ خس ـ خس سینە

**سیخەسیخ** / sixesîx/: دەنگەناو. نیخەنیخ؛ دەنگی سینگ ☰ صدای خس ـ خس سینە

**سیخە . سیخە** / sîxe sîxe/: دەنگەناو. سیخەی یەک لە دوای یەکی سنگ ☰ خس ـ خس پیاپی سینە

**سیدرە** / sîdre/: ☜ **سیتر**

**سیر** / sîr/: ناو. ١. سیرک؛ گیایەکی ئالیکی بە سەلکی هەڵتۆقیوی بنئەرزیلەی لەتکە جیاواز لە ناو کاژی ناسک و سپیدا، بە گەڵای هێلکەیی نووکتێژ و گوڵی سپی چەترییەوە ٢. سەلکی ئەو گیایە کە سپی و توونە، بۆنێکی تیژی هەیە، دەخورێ و دەرمانیشە ٣. یەکەی کێشان بەرانبەر بە ٧٥ گرەم ☰ ١تا٣. سیر

◘ **سیر تێدان**: /کینایە/ سیر دان؛ بزواندن؛ هەڵخڕاندن ☰ تحریک کردن

**سیر دان**: ☜ **سیر تێدان**

**سیرئەنجن** / sîr'encin/: ناوەڵناو. /کینایە/ سیرەنجن؛ وردوردکراو ☰ ریز-ریز شدە

**سیراج** / sîrac/: ناو. شیرێژ؛ سیرێژ؛ شیراز؛ ژاژی؛ خواردنێکە لە دۆی کوڵاو دەس دەکەوێ ☰ شیراز؛ محصولی از دوغ جوشاندە

**سیرپڤک** / sîrpivik/: ☜ **سیرەمۆکە**

**سیرجە** / sîrce/: ناو. نەخۆشییەکی یەکسمە پێی دەمرێ ☰ از بیماری‌های مُهلک دام

**سیردم** / sîrdim/: ☜ **سیرەمۆکە**

**سیرسیر** / sîrsîr/: ☜ **سیسرك**

**سیرسیرە** / sirsîre/: ☜ **سیسرك**

**سیرک** / sîrk/: ناو. ١. ☜ **سیرەمۆکە** ٢. شوێنی ڕانانی شانۆکی گیانەوەرانی دەسەمۆ، بەنبازان، گاڵتەجاڕان و چاوبەستان ‹چووبووینە سیرک زۆر سەیر بوو› ٣. گرۆیەک کە بەرنامەی وا بەڕێوە دەبەن ☰ ١. ☜ **سیرەمۆکە ٢و٣**. سیرک

**سیرکامارا** / sîrkamara/: ناو. گیایەکی بۆن ناخۆشە ☰ گیاهی بدبو

**سیرکۆ** / sîrko/: ناو. دینگی چەڵتووک کوتان ☰ دنگ شالیکوبی

**سیرم** / sîrim/: ☜ **سیرمە**

**سیرمۆک** / sîrmok/: ☜ **سیرەمۆکە**

**سیرمۆکە** / sîrmoke/: ناو. پیازەمارانە؛ گیایەکە ☰ گیاهی است

**سیرمە** / sîrme/: ☜ ناو. سیرم: ١. باریکەیەک لە چەرم ‹گورزەهۆنی سیرمەی دووبادی دە ملدا «هەژار، *قورئان*»› ٢. تەسمە؛ ئالقەیەکی قایم لە چەرم، کانزا، پلاستیک و ... بۆ گواستنەوەی هێزی موتور ☰ ١. نوار چرمی ٢. تسمە

**سیرمەخۆر** / sîrmexor/: ناو. *[پلار]* دزی خوێرپلـە ☰ دلەدزد

**سیرمەخـۆری** / sîrmexorî/: نـاو. قـاچوقـووچ؛ شڕەخۆری ☰ دلەدُزدی

**سیرمەکێش** / sîrmekêş/: نـاو. ئـامرازێ کـە کلاشدروو دەکاری دەکەن ☰ ابزاری در گیوەسازی

**سیرنۆک** / sîrnok/: ناو. تەرزەی ورد ☰ تگرگ ریز

**سیرۆش** / sîroş/: ناوەڵناو. تینوو ☰ تشنە

**سیرۆم** / sîrom/: ناو. چەرمی تەنک ☰ چرم نازک

**سیروول** / sîrûl/: ناو. مێشەنگوێن؛ هـەنگ ☰ زنبـور عسل

**سیرەت** / sîret/: ناو. ١. ئەندامی زاوزێـی کوڕیژگـە ٢. *[مەجاز]* ئابڕوو؛ ئـاوڕوو ☰ ١. دول؛ آلـت تناسـلی پسر بچە ٢. آبرو

**سیرەتزەلام** / sîretzelam/: ناوەڵـناو. *[شـوورەیی]* کێرزل ☰ کیرکُلُفت

**سیرەج** / sîrec/: ناو. ڕۆنی کونجی ☰ روغن کُنجد

**سیرەسەگانە** / sîresegane/: ☜ **سیرەمۆکە**

**سیرەقوڕاڵە** / sîrequřałe/: ☜ **کنیواڵ**

**سیرەقوڕۆڵە** / sîrequřoɫe/: ☜ **کنیواڵ**

**سیرەکوللۆرە** / sîrekullore/: نـاو. جۆرێـک سـیرە گەلاکەی وەک پیواز لووسە، لە دۆکلیوی دەکەن ☰ نوعی سیر کوهی

**سیرەکۆ** / sîreko/: نـاو. ماڵـەی بـەردینی گـڵ ☰ مالەی سنگی گل

**سیرەمۆزە** / sîremoze/: نـاو. سۆرەمزە؛ سـوورەمۆز؛ سوورەمۆزە: ١. جۆرێ مۆزە کە بە ڕەشـەولاخەوە دەدا ٢. مێرووی سووری لە زەرگەتە گـەورەتر ☰ ١و٢. موسەی قرمز

**سیرەمۆکە** / sîremoke/: نـاو. سیرپڤـک؛ سـیردم؛ سیرک؛ سیرمۆک؛ سیرەسەگانە؛ گیایەکە ڕەگەڵ پەنیری دەخۆن ☰ سیر کوهی

**سیرەنجن** / sîrencin/: ☜ **سیرنەنجن**

**سیرەونە** / sîrewne/: ناو. قوونسـوور؛ گیایەکـە بـۆ دۆکلیو دەبێ ☰ گیاهی خوراکی

**سیریوم** / sîryum/: ناو. توخمی کیمیاوی کـانزایی لە دەستەی لانتانیدەکان، بە ژمارەی ئەتومی ٥٨ و کێشی ئەتومی ١٤٠,١٢، ڕەنگی خۆڵەمێشـی و چـەکوچخۆر، لـە ئـاودا دەتوێتـەوە و لـە هـەوادا دەســووتێ و بـۆ بەرهــەم هێنــانی ئالیــاژی بەردەچەخماخ و تۆڕی چراتۆڕی بـەکار دێـت ☰ سِریُم

**سیرێژ** / sîrêj/: نـاو. ١. جـۆرێ چێشـتە ٢. ☜ **سیراج** ☰ ١. نوعی آش ٢. ☜ **سیراج**

**سیڕم . سیڕم** / sîřim sîřim/: ناوەڵکار. سپڕ ـ سپڕ؛ زۆر زۆران؛ کۆڵەکەزۆران ‹بە سیڕم ـ سیڕم بـردی› ☰ با زور و فشار

**سیڕە**[١] / sîře/: ناو. قیژە؛ زیڕە ☰ جیغ

**سیڕە**[٢]: دەنگ. ١. دەنگی وەک دەنگی بـە دەسـت شکاندنی کەلەم یان پـێ لـە سـەر بـەفر نـان ٢. قیژەی پەلەوەر ‹پـێش ئـەوەی سـیڕەی هەلـۆیان، پەردەی بێدەنگی دادڕێ/ پێش ئەوەی چوڕەپۆپنەکەی بەرەو رووناکی هەڵفڕێ «هێمن»› ٣. وشـەیەکە بـۆ دەرکردنی مێشەنگوینی دەڵێن ☰ ١. صدای شبیه فشُردن برف زیر پا ٢. جیغ برخی پرنده، مانند کبک از ترس ٣. اصطلاحی برای راندن زنبور عسل

**سیڕەسیڕ** / sîřesîř/: دەنگەناو. ١. دەنگـی شـکانی کەلـەم ٢. قیژەقیـژ؛ زیڕەزیـڕ ٣. قیـژەی مـەل (وەک: هەڵۆ، شەهێن، کەو و ...) ‹نە نارەناری کیژی مەشـکەژێنە/ نـە سیڕەسـیڕی شمقـاڕ و شـەهێنە «هێمن»› ☰ ١. صدای شکافتن کلم ٢. جیغ و داد ٣. جیغ پرندە

**سیزار** / sîzar/: نـاو. قەیسـەر؛ نازنـاو و سـەرناوی ئیمپراتوورانی ڕۆم ☰ سِزار

**سیزاریەن** / sîzaryen/: ناو. کاری دەرهێنانی مناڵ لە سکی دایک بە نەشتەرگەری ☰ عمل سزارین

**سیزواڵ / sîzwał/**: ناو. سوورەساقە؛ سوورەسەقەتە؛ سووره‌قەتە؛ خەیاتـە؛ زەڕنەقووتـە ☰ جوجـه گنجشک پر درنیاورده

**سیزە / sîze/**: ناو. سیزی؛ دەرزی ☰ سوزن

**سیزی / sîzî/**: ☜ **سیزە**

**سیزیوم / sîzyum/**: ناو. توخمی کیمیاوی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ٥٥ و کێشی ئەتومی ۱۳۲,۹۰، نەرم و زیولام کـە لـە بـەر هـەوادا زۆر زوو ڕەش دەبێتەوە ☰ سزیُم

**سیس[1] / sîs/**: نـاو. ۱. زاخـە؛ کـوول؛ کـەوێل ۲. مێشێکە لە هەنگ دەکا ☰ ۱. زاغه ۲. مگسی شبیه زنبور عسل

**سیس[2]**: ناوەڵناو. ۱. چرمس؛ ژاکاو ۲. مووخورمـایی ۳. فرەچـەرمگ؛ زۆر سـپی ☰ ۱. پژمُـرده ۲. موخرمایی ۳. بسیار سفید

▣ **سیس بوون**: ژاکان ‹بە کول گریـان لـە چـاوم دێ گولی لاولاوی ڕەنگاوڕەنگ/ لـە بـەر چـی سـیس ئەبی وا زوو؟ چییە ئەسبابی ژاکانت؟ «گۆران»› ☰ پژمُردن

**سیس هەڵاتن**: ☜ **سیس هەڵگەڕان**

**سیس هەڵگەڕان**: سـیس هـەڵاتن؛ هەڵـچرچان؛ ژولیان ☰ پژمُرده شدن

**سیسا / sîsa/**: ناو. جۆرێ تۆمی گەنم ☰ نوعی گندم

**سیسارک / sîsark/**: ☜ **سیسارگ**

**سیسارکەکەچەڵە / sîsarkekeçeŀe/**: ☜ **سیسارگ**

**سیسارگ / sîsarg/**: نـاو. سسـارک؛ سمسـارک؛ سمیـارک؛ سـەرگەڕ؛ سـیارک؛ سیسـارک؛ سیسارکەکەچەڵە؛ سیسارگەکەچەڵە؛ سیسالەک؛ سـیالەک؛ سیسالـەک؛ سیسـالک؛ تاسکەچەڵـە؛ کەپەنەک؛ کەپەنەکدال؛ کەچەڵۆک؛ کەچەڵۆک؛ کەرگەز؛ کەرکەس؛ تەیرێ کەلەخا؛ مەلـەوەڕێگر؛ باڵندەیەک لە تـیرەی لاشـخۆر بـەلام هێنـدێک گچکەتر، بە پـەڕی ڕەش و سـپی و جووچکـەی سێسووچی سپی و دەندووکی کورت و ئەستوور و سەر و ملی ڕووتەوە ☰ کرکس

**سیسـارگەکـەچـەڵـە / sîsargekeçeŀe/**: نـاو. تاسکەچەڵە؛ سیسارگ ☰ کرکس

**سیسالک / sîsalik/**: ☜ **سیسارگ**

**سیسالەک / sîsalek/**: ☜ **سیسارگ**

**سیساڵەک / sîsałek/**: ☜ **سیسارگ**

**سیسان / sîsan/**: نـاو. بـەیانی ڕوون؛ شـەوەکی ☰ فجر صادق

**سیسای / sîsay/**: چاوگ. سـیس بـوون ☰ پژمُـرده شدن

**سیسپەست / sîspest/**: ناو. *[مەجاز]* دۆخـی نـەمانی هێز و توانی جینسی ☰ زوال نیروی جنسی

**سیستر / sîstir/**: ناو. سستەر؛ پەرستار ☰ پرستار

**سیستم / sîstim/**: ☜ **سیستەم**

**سیستەم / sîstem/**: ناو. سیستم: ۱. دەزگا؛ سامانە؛ کۆئەندام؛ گروپەک لە شت، بابەت یان دیـاردەی پێکەوەگیری ڕێکوپێک کە کۆمەڵـەیەک پێـک دێـنن ‹سیستەمـی میتـری› ۲. نیـزام؛ دوزەنـە ‹سیستەمـی حوکمـەتی› ۳. تـۆڕ؛ ئـەوەی بەشینەوەی شتێ یان بەڕێوە بردنی ڕاژەگـەلێکی وە ئەسـتۆیە ‹سیستەمـی کارگێـڕی› ٤. ئـەوەی (بەتایبەت لەمەڕ ماشێن و دەزگاوە) بیچم، پێکهاتە، یـان شـتومـەکی تایبـەت بـە خـۆی هەیـە ‹سیستەمـی کارەبایی› ☰ ۱تا۴. سیستم

**سیستەماتیک / sîstematîk/**: ناوەڵناو. ڕێـکوپێـک؛ سامانمەند؛ تەکووز ‹هەڵبژاردنی سیستەماتیک› ☰ سیستماتیک؛ سامانمند

**سیسرک / sîsirk/**: ناو. سفرەبڕ؛ سفرەبڕە؛ سیسۆک؛ سیسۆکە؛ بەرزەچڕ؛ شیرشیرە؛ زیرزیرە؛ جرجـرە؛ زیرزیـرەک؛ چیچـرک؛ چرچـرۆ؛ چیرچـیرۆک؛ سیرسـیر؛ سیرسـیرە؛ مێروویەکـە لـە تۆرەمـەی

ڕاستبالان، خزمی کلۆکان، شەوانە چالاکە و دەخوێنێ، باڵەکانی دواوەی ناسک و لە ژێر باڵە باریکەکانی پێشەوەی قەد کراوە، ٢٥٠٠٠ جۆریان هەیە! ☰ جیرجیرک

**سیسرکە** / sîsirke/: ناو. چیچرک؛ سیسرە؛ مەشکەدڕە ☰ جیرجیرک

**سیسرە** / sîsre/: ناو. سیرسیر؛ جانەوەرێکە لە تیرەی کلوڕەشە هەمیشە لە مەزرایە و دەنگی دێ ‹بۆق لە سەر نوێنی قوڕین قیڕەی دێ/ سیسرە ژێتاری شڕە و سیڕەی دێ «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ چرخریسک؛ نوعی جیرجیرک

**سیس‌عەمەر** / sîs'emer/: ☜ سوسەمبەر

**سیس‌عەنبەر** / sîs'enber/: ☜ سوسەمبەر

**سیسکە** / sîske/: ناو. جۆرێ مار ☰ نوعی مار

**سیسمۆنی** / sîsmonî/: ناو. جل و پێداویستی کۆرپە، کە لە لایەن ماڵی بووکەوە پێش لە دایک بوونی یەکەمین کۆرپە بە دیاری بۆی دەبەن ☰ سیسمونی

**سیسنای** / sîsnay/: چاوگ. سیس کردن ☰ پژمُردە کردن

**سیسۆ**[1] / sîso/: ناو. حیندرحۆ ☰ الاکُلنگ

**سیسۆ**[2]: ناوەڵناو. مووزەرد ☰ بُور

**سیسۆک** / sîsok/: ☜ سیسرک

**سیسۆکە** / sîsoke/: ☜ سیسرک

**سیسۆڵە** / sîsołe/: ناوەڵناو. [*پلار*] سیسەڵە؛ سیسەکە؛ داڵگۆشتی زەردەڵەی لەجەر ☰ لاجون؛ لاغرمُردنی

**سیسو** / sîsû/: ناو. بڕبەندی سێ سووچ ☰ سوهان سەگوش

**سیسەکە** / sîseke/: ☜ سیسۆڵە

**سیسەڵە** / sîsełe/: ☜ سیسۆڵە

**سیسەمار** / sîsemar/: ناو. ١. سیسکە ٢. [*کینایە*] مرۆی دەبنەوەبڕ ☰ ١. نوعی مار ٢. آدم تودار

**سیسەن** / sîsen/: ☜ سوێسنە

**سیسەنبەر** / sîsenber/: ☜ سوسەمبەر

**سی.سی.** / sî.sî./: ناو. سانتیمیتری چوارپاڵوو ☰ سی. سی.

**سیسی**[1] / sîsî/: ناو. ١. پەراسووی پشت؛ ئێسکی کەوانەیی سەر پشت ٢. ژاکاوی؛ سیسیاگی ٣. دانۆکەکەنگر ٤. جلە؛ گیایەکە خۆی لە قەد گژ و گیای‌تر دەهاڵێنێ و وشکی دەکا ☰ ١. دندەی پشت ٢. پژمُردگی ٣. کنگردانە ۴. گیاهی آفت گیاهان دیگر

**سیسی**[2]: دەنگ. وشەی دنەدانی گۆڵە سەگ بۆ سواری دێڵ بوون ☰ کلمەی تحریک سگ نر برای جفت‌گیری

**سیسیاگی** / sîsyagî/: ناو. سیسی؛ ژاکاوی ☰ پژمُردگی

**سیسیان** / sîsyan/: چاوگ. ژاکان؛ سیس بوون ☰ پژمردن

**سی.سی. یو** / sî.sî.yû/: ناو. بەشی تایبەتی چاوەدێری لە نەخۆشانی دڵ لە نەخۆشخانەدا ‹نیمەشەو حاڵی تێکچوو، بردیانە سی.سی.یوو.› ☰ سی. سی. یو.

**سیسێ** / sîsê/: ناوەڵناو. قژزەرد (ژن) ☰ موطلایی (زن)

**سیشوار** / sîşwar/: ناو. ئامێرێکی کارەبایی کە بە ساز کردنی بای گەرم، قژ وشک دەکاتەوە ☰ سشوار

**سیغار** / sîğar/: ☜ سیگار

**سیفا** / sîfa/: ناو. چۆنیەتی ڕامان و بیر کردنەوە ☰ تأمُل

**سیفر** / sîfr/: ناو. سفر: ١. نیشانەیەکی بیرکاری بە شێوەی «٠» کە نیشاندەری نەبوونی چەندیەتییەکە ٢. خاڵی دەسپێک لە ژماردن یا ئەندازە گرتندا ‹خاڵی سیفری پلەکی هەواپێو› ٣.

کەمترین نمرەی وانەیی کە نیشانەی لێنەهاتوویی قوتابییە لەو کارانەی کە لێی خوازراوە ‹لە کیمیادا سیفرم گرت!› ١تا٣. صفر
▣ **هاتنە سەر سیفر**: هیچ پێ نەمان؛ هەمو دارایی و ماڵ و سامانێک لە دەست دان ‹زۆر جاریش بوومە خاوەن پارە و دیسان هاتوومەوە سەر سیفر و دیسان تێهەڵچوومەوە «هەژار، چێشتی مجێور»› همه چیز را از دست دادن

**سیفۆکە** / sîfoke/: ناو. گیایەکە لە کونجی دەکا گیاهی شبیه کُنجد

**سیفۆن** / sîfon/: ناو. ١. عەماراوی سەر دەساو کە بە کێشانی لۆسەیەک، ئاوەکەی بە تەوژمەوە دەڕژێتە خوار و کاسەی دەساوەکە دەشواتەوە ٢. وشترگەڵوو؛ وشترگەروو؛ گونجەی سوالەتی، سمنتی یان چودەنی تێکخراو بۆ ڕاگوێزانی ئاو ١و٢. سیفُن

**سیفەت** / sîfet/: ناو. ئاوەڵناو صفت

**سیڤان** / sîvan/: ناو. چەتری بەر خۆر چتر تابستانی

**سیڤۆی** / sîvoy/: ناو. سەربێژنگ نُخاله

**سیڤە** / sîve/: ئاوەڵناو. قەڵەو؛ پڕگۆشت چاق

**سیڤەرۆک** / sîveřok/: سێفزەمینە

**سیق**[1] / sîq/: ناو. سیقە؛ سیک: ١. دانی خوراوی هەزم نەکراوی ناوزگی مەل ٢. ورگ؛ مەعدە ١. مواد داخل چینەدان ٢. معده

**سیق**[2]: دەنگەناو. سیقە؛ سیک؛ دەنگی شمشێر لە کالان دەرکێشان صدای آختن شمشیر از نیام

**سیقاف** / sîqaf/: ئاوەڵناو. حەنەکچی؛ قسەخۆش بذله‌گو

**سیقاڵ** / sîqał/: ناو. مشت و ماڵ؛ کاری ساف و لووس کردنی کانزا صیقل فلز

**سیقل** / sîqil/: ناو. جێکل؛ سیق؛ چینەی هەزمنەکراو چینەی هضم‌نشده

**سیقلدان** / sîqildan/: ناو. سیقلدانە؛ سیقڵدان؛ سیقلدانک؛ جیقڵدان؛ گژار چینه‌دان

**سیقلدانک** / sîqildanik/: سیقلدان

**سیقلدانە** / sîqildane/: سیقلدان

**سیقڵدان** / sîqiłdan/: سیقلدان

**سیقوتە** / sîqute/: ناو. قۆتک؛ قۆخەڕەشە؛ کوخکاڕەش سیاه‌سُرفه

**سیقە** / sîqe/: ناو. ١. سیق ٢. نزگەرە ١. سیق ٢. سکسکه

**سیقەتۆرە** / sîqetore/: سیکەتۆرە

**سیک**[1] / sîk/: ناو. ١. سووچ؛ گۆشە ٢. *[شوورەیی]* تس؛ بای بێدەنگی قنگ ٣. سیق[1] ١. زاویه؛ گوشه ٢. چُس ٣. سیق[1]
▣ **سیک کردن**: هیچ پێ نەهێشتن (زاراوەیەکە لە مێشێندا) اصطلاحی در تیله‌بازی به معنی «لُخت کردن»

**سیک**[2]: ئاوەڵناو. چاوچنۆک؛ ماڵ خۆ نەخۆر خسیس

**سیکار** / sîkar/: ناو. چەقۆ؛ کێرد؛ کارت کارد

**سیکارد** / sîkard/: ناو. تەور؛ تەوەر تبر

**سیکک** / sîkk/: ناو. سێبەر؛ سێوەر؛ سا سایه

**سیکلدانۆچکە** / sîkildanoçke/: ناو. لوولەکانی سیپەلاک نایژه

**سیکمەسیکم** / sîkmesîkm/: ناو. ١. کاری هاتوچۆ و مڵومۆی سەگ لە دەرک و بان ٢. *[پلار]* سۆکەسۆک؛ کارەڕەهاتی هاتوچۆی پیاوێک بۆ ساز کردنی کچێک ١. عمل گشتن و بو کشیدن سگ ٢. رفت‌وآمد مرد هیز برای جور کردن دختری

**سیکوژ** / sîkuj/: ناو. باڵندەیەکە لە تیرەی شەهێنەکان، نزیک ٤٨ سانتیمیترە، پەلەوەرانی تر ڕاو دەکا، لە شوێنی ئاوەلا، کوێستان و ڕەوەزی بەرز دەژی، لە هەڵدێر و جاری وایە لە کۆنەمالان هێلانە دەکا بحری

**سیکولار** / sîkular/: ئاوەڵناو. لادین؛ بێ دین؛ بێ بڕوا بە ئامۆژە دینییەکان ⇐ سکولار

**سیکولاریسم** / sîkkularîsm/: ناو. سیستەمی لادینی؛ دین‌لایی؛ سیستەمێ حکوومەتی یان فیرکاری کە کاری بە سەر ئامۆژەگەلی دینییەوە نییە ⇐ سکولاریسم

**سی‌کوێرە** / sîk(i)wêre/: ناو. سی‌لالە؛ قازەلالە؛ جۆرێ قازە کە لە قەراغ ئاوان دەژی بە پێچەوانەی خاسەسی کە زۆر بە قاژ و قووژە، زریوەزریو دەکا ⇐ غاز پازرد

**سیکەتۆرە** / sîketore/: ناو. سیقەتۆرە؛ سیکەدانە؛ کولەزرگ ⇐ سنگدان

**سیکەدانە** / sîkedane/: ☜ **سیکەتۆرە**

**سیکەنەوسەرخان** / sîkene w serxan/: ناو. تێکەولێکە؛ کەس‌لەکەس؛ جێگای زۆر قەرەباڵغ ⇐ جای شلوغ

**سیگار** / sîgar/: ناو. سگار؛ سیار؛ سیغار؛ جگەرە؛ جگارە؛ جغارە؛ جغەرە؛ تووتنی دەکاغەزەوە پێچراو بۆ کێشان ⇐ سیگار

**سیگاری** / sîgarî/: ئاوەڵناو. سگاری؛ سگارکێش ⇐ سیگاری

**سیل** / sîl/: ناو. ١. پلووسک؛ لووساوک ٢. نەخۆشی دیق ٣. سیقاڵ؛ بریقە؛ بریکە ٤. کاری سپی کردنەوەی مس ٥. هەسێل؛ ئەستێل ⇐ ١. ناودان ٢. بیماری سل ٣. صیقل ٤. سفیدگری ظرف مسین ٥. استخر کوچک

▣ **سیل کردن**: سیقاڵ دان؛ بریقە لێ خستن ⇐ صیقل دادن

**سیلا** / sîla/: ناو. سیلاخ؛ کون؛ کونا؛ قول ⇐ سوراخ

**سیلاخ** / sîlax/: ناو. ١. ☜ **سیلا** ٢. شوێنێ کە ڕەڵمی زۆر لێیە ⇐ ١. ☜ **سیلا** ٢. ریگزار

**سی‌لاڵە** / sîlałe/: ☜ **سی‌کوێرە**

**سیلامیش** / sîlamîş/: ناو. کونەمشک؛ قولەمشک ⇐ سوراخ موش

**سیلان** / sîlan/: ناو. مووروگێکی ڕەشە بۆ خشڵی ژنان دەبێ ⇐ از مهره‌های زینتی زنانه

**سیلاوی** / sîlawî/: ئاوەڵناو. گیرۆدەی سیل و دیق ⇐ مبتلا به سل

**سیلدار** / sîldar/: ئاوەڵناو. ئەزرەودار؛ وەرەمی؛ ژانازراف‌کەتی ⇐ مسلول

**سیلسانک** / sîlsanik/: ناو. سەقری سپی واش ⇐ چرغ سفید

**سیلک** / sîlk/: ناو. ١. خیزی چۆمان ٢. ڕەمڵ ⇐ ١. شن رودخانه ٢. ریگ

**سیلکە** / sîlke/: ئاوڵناو. ڕەسەن بۆ خستنە سەر ماکەر (نێرەکەر) ⇐ فحل (نرّەالاغ)

**سیللول** / sillûl/: ناو. خانە؛ خانک؛ چاوە ⇐ سلول

**سیلماتە** / sîlmate/: ناو. سەمیر؛ سەمسیر؛ تلفی ترێ ⇐ تُفالەی انگور فشُرده

**سیلۆخ** / sîlox/: ئاوەڵناو. لەڕ و لاواز؛ زەردەڵ و نەخۆش ⇐ لاغرمُردنی

**سیلە** / sîle/: ناو. ١. سووچ؛ کونج؛ گۆشە ‹گیرۆدەی کردبوو بە بسکی خاوی/ دیوانەی کردبوو بە سیلەی چاوی «هێمن»› ٢. ڕەقەی ناو ئاو ⇐ ١. کُنج؛ گوشه ٢. کَشَف؛ لاکپشت آبی

**سیلەخۆر** / sîlexor/: ناو. جۆرێ ماسی ⇐ نوعی ماهی

**سیلەندر** / sîlendir/: ناو. ١. گرۆڤەر؛ گلیل ٢. قاپۆرەیەکی گرۆڤەر لە موتوری ماشێندا کە پیستوونی تێدا دەبزێوێ ⇐ ١. استوانه ٢. سیلندر

**سیلەوچەفتە** / sîle w çefte/: ناو. سێرە؛ کاری سێرە گرتنی بە تفەنگ بۆ پێکانی ئامانج ⇐ نشانه‌گیری

**سیلی** / sîlî/: ناو. بەڵمە برنج ⇐ کاه شالی

**سیلیسیوم** / sîlîsyum/: ناو. توخمی کیمیاوی ناکانزا، بە ژمارەی ئەتومی ١٤ و کێشی ئەتومی

٢٨،٠٨ کە لە دوای ئۆکسیژن، زۆرترین توخمە و نزیک بە ١٪ لە توێکڵەی نەگۆڕی زەوی پێک دێنێ ☰ سیلیسیم

**سیڵخان** / sîłxan/: ناو. لیتە و قوڕی ناو جۆگە ☰ لای و لجن جویبار

**سیم** / sîm/: ناو. ١. تالی زیو؛ هەودا لە زیو ٢. تەل؛ تێل ☰ ١. سیم نُقره ٢. سیم

**سیما** / sîma/: ناو. تەحر و دیدار؛ دەموچاو؛ بیچم ☰ سیما

**سیماڤ**[1] / sîmav/: ☚ سیماو

**سیماڤ**[2]: ناوەڵناو. ڕووکەش‌کراو بە زیو ☰ نقره‌اندود

**سیمان** / sîman/: ناو. چیمەنتۆ؛ چەمەنتۆ؛ سمنت ☰ سیمان

**سیماو** / sîmaw/: ناو. سیماڤ؛ سپیاو ☰ سفیداب

**سیمبەند** / sîmbend/: ناو. تەڵبەند ☰ سیم‌بند

**سیمپێچ** / sîmpêç/: ناو. سیمێکی لوولپێچ کە بە هۆی تێپەڕینی کارەباوە، مەیدانی میگناتیسی بەدی دێنێت ☰ سیم‌پیچ

**سیمر** / sîmir/: ناو. سیمرخ؛ سیمرغ؛ سیمەرخ؛ سیمورغ؛ مەلێکی ئەفسانەیی کە نامانای ژیرییە و دە کێوی قافدا دەژی ☰ سیمُرغ

**سیمرخ** / sîmirx/: ناو. ١. ☚ سیمر ٢. ☚ سخورمە

**سیمرغ** / sîmirğ/: ☚ سیمر

**سیمڕ . سیمڕ** / sîmiř sîmiř/: ☚ سمڕ ـ سمڕ

**سیمڕۆ** / sîmiřo/: ناو. گای مارۆ؛ مرۆڤی ناسراوی ناماقووڵ ☰ گاو پیشانی سفید

**سیمڕکێ** / sîmiřkê/: ☚ سێ‌جرتی

**سیمکارت** / sîmkart/: ناو. کارتێکی تایبەتی بۆ ڕێخستنی بڕێ کەرستەی کارەبایی (وەک: تەلەفوون، کارتی بانکی یان قوڵفی کارتی) ☰ سیم‌کارت

**سیمکە** / sîmke/: ناو. ١. نیر؛ نێڵە ٢. کەڵەوە؛ ئاڵقەی دارینی ملی گا ☰ ١. یوغ ٢. چنبرەی گردن گاو

**سیمکەش** / sîmkeş/: ☚ سیمکێش

**سیمکەشی** / sîmkeşî/: ☚ سیمکێشی

**سیمکێش** / sîmkêş/: ناو. سیمکەش؛ کەسێ کە کاری دامەزراندنی تێلی کارەبایە بۆ کاری جۆراوجۆر ☰ سیمکش

**سیمکێشی** / sîmkêşî/: ناو. سیمکەشی؛ تەلکێشی؛ کار و ڕەوتی دامەزراندنی سیم و پێداویستیی تر لە شوێنێکی تایبەتی بۆ پێکهێنانی خولگە یان تۆڕێکی نوێ کارەبایی و ... ☰ سیمکشی

**سیمن** / sîmin/: ☚ سیمەن

**سیمورغ** / sîmurğ/: ☚ سیمر

**سیموەنگ** / sîmweng/: ناوەڵناو. لە ڕەنگی زیو؛ وەک زیو «ئەو سینەی سیموەنگ ئاینەی جەمە ڕەنگ/ مەنمانۆ هەوەس نە دڵ دای خەدەنگ «مەولەوی»» ☰ سیمین

**سیمۆت** / sîmot/: ☚ سامۆرتە

**سیمۆتە** / sîmot/: ☚ سامۆرتە

**سیمەرخ** / sîmerx/: ☚ سیمر

**سیمەڕۆ** / sîmeřo/: ناوەڵناو. مارۆ؛ تەوێڵ چەرمووگ (گا) ☰ پیشانی سفید (گاو)

**سیمەن** / sîmen/: ناوەڵناو. سیمن؛ سینەم؛ چێکراو لە زیو ☰ سیمین

**سیمەه** / sîmeh/: ناو. گەمەیەکی گوندنشینانە ☰ از بازی‌های روستاییان

**سیمیار** / sîmmyar/: ناو. خەفزان؛ غەیبوێژ ☰ غیبگو

**سین** / sîn/: ناو. ناوی عەرەبی پیتی پازدەهەمی ئەلفوبێتکەی زمانی کوردی ☰ سین؛ نام حرف «س»

**سینامەکی** / sînamekî/: ☚ سنامەکی

**سینتیم** / sîntîm/: ☚ سانتیم

**سینجوڕ** / sîncuř/: ناو. سنجر؛ تیشکی ئاور شرارەی آتش

**سینجی** / sîncî/: ☜ **سرینچك**

**سینچک** / sînçik/: ☜ **سرینچك**

**سینچکە** / sînçke/: ناو. زیپکە؛ زیپرک جوش ریز بر پوست

**سینچکەسڵاو** / sînçkes(i)ław/: ☜ **سیتکەسەلام**

**سینچکەسڵاوە** / sînçkes(i)ławe/: ناو. چینچک؛ باپشکێو؛ قنچکەسلام گُل‌مُژە

**سینک** / sînk/: ناو. کاسەی دەفرشۆری؛ لەگانی کانزایی لە چێشتخانەدا بۆ دەفر تێدا شۆردن سینک ظرفشویی

**سینگ** / sîng/: ناو. ١. لە زگ بەرەژوور تا بەر مل ٢. لە نێو قەدی کەژ و کێو بەرەو ژوور ٣. سنگ؛ بزماری گەورە لە دار ١. سینە ٢. سینەکش کوە ٣. میخ کُلُفت چوبی

■ **سینگی پێ**: قوولایی ژێر پێ ‹سینگی پێی جارجار ئەدا لە زەوی/ بیر ناکاتەوە لە کۆکەی شەوی «قانع»› سینەی پا

**سینگبەسینگ** / sing be sîng/: ☜ **سینەبەسینە**

**سینگسپیلکە** / sings(i)pîlke/: ناو. بەرلووزەوە؛ چۆلەکەچۆمە زیرآبروک

**سینگوبەر** / sing û ber/: ناو. سینگ و بەرۆک؛ سینە.و بەرۆک سینە و گریبان

**سینگ و بەرۆک** / sing û berok/: ☜ **سینگوبەر**

**سینگە** / sînge/: ناو. لای پێشەوە طرف جلو

**سینگەباز** / sîngebaz/: ☜ **سنگەباز**

**سینگەزەرد** / sîngezerd/: ناو. سینگەزەردە؛ چۆلەکەئاسایەکی سینگ و بەرۆک زەرد و بان پشت بۆر و دەوری مل ڕەشە باوکانەکەی جوان دەخوێنێ و دایکانەکەی وەک مێوینەی پاسارییە، لە نسارانداا هێلانە دەکا سینەزرد

**سینگەزەردە** / singezerde/: ☜ **سینگەزەرد**

**سینگەسپیلکە** / singes(i)pîlke/: ناو. بەرلووزەوە؛ چۆلەکەچۆمە زیرآبروک

**سینگەسۆژ** / sîngesoj/: ناو. ١. دڵەکزێ ٢. ژانی سینگ و سک ١. دل‌درد ٢. سینەدرد

**سینگەوباز** / singe w baz/: ☜ **سنگەباز**

**سینۆر** / sînor/: ☜ **سنور**

**سینۆزیت** / sînozît/: ناو. سینووزیت؛ کەڵەمقاو؛ ئاییسان و هەو کردنی سینووسەکانی سەر و چاو سینوزیت

**سینوزیت** / sînûzît/: ☜ **سینۆزیت**

**سینوس** / sînûs/: ناو. ١. *[تویکاری]* هەرکام لە هلۆلی و کلۆرییەکانی نێو ئێسکی کاپۆڵ، لە سەر ڕێگای هەناسەدان (وەک: سینووسی هەنیە و لووت) ٢. *[ریازی]* یەکێ لە ڕێژەکانی هەندەسە کە بە دروشمی sin نیشان دەدرێت ١و٢. سینوس

**سینە** / sîne/: ناو. ١. سینگ؛ بەشی پێشووی لەش، لە زگ بەرەوژوور تا بەرگەردن ٢. مەمکە؛ مەمک ٣. سنگ؛ سی؛ سپەلاک ‹شەربەتی سینە› ٤. *[مەجاز]* ناخ؛ دڵ؛ دەروون ‹سینەی بێ‌کینەی پراوپڕ لە دەرد› ٥. *[مەجاز]* بەر یادگە؛ بیر؛ حافیزە ‹زۆر شیعری کوردی لە سینەدایە› ١. سینە ٢. پستان ٣. سینە؛ ریە ۴. درون ۵. حافظە

**سینەباز**[1] / sînebaz/: ☜ **سنگەباز**

**سینەباز**[2]: ناوەڵناو. سنگ و بەرۆک ئاواڵە سینەباز؛ سینە عُریان

**سینەبەرە** / sînebere/: ناو. بەرەی زینی ئەسب سینەبند زین

**سینەبەسینە** / sînebesîne/: ناوەڵکار. *[مەجاز]* سینگ‌بەسینگ؛ دەم‌بەدەم؛ بە شێوەی ڕاگوێزانی زارەکی ‹زۆربەی ویژەی فولکلۆرمان سینەبەسینە هاتووە› سینەبەسینە

**سینەبەن** / sîneben/: ناو. سینەبەند: ١. سینەبەرە؛ بەرە ٢. زەنبەرێکە لە گەردنەوە دێتە سەر سنگ

🇮🇷 ۱. سینەبند زین ۲. گردنبند تا روی سینە

**سینەبەند** / sînebend/: ناو. ۱. ☜ **سینەبەن** ۲. چارۆکەی سینەپۆش 🇮🇷 ۱. ☜ **سینەبەن** ۲. پیشبند تا روی سینە

**سینە پاڵوو** / sînepałû/: ناو. پزوو؛ فرک؛ ئاڤسینگ؛ بەرەزام؛ ژان و پەنەمانی سیپەلاک لە سەرماوە 🇮🇷 سینەپهلو

**سینە پۆش** / sînepoş/: ناو. ۱. چارەکەی سنگ‌پۆش ۲. بەروانکەی منال ۳. سوخمە؛ سخمە؛ سیخمە 🇮🇷 ۱. پیشبند کارگر ۲. سینەبند بچە ۳. یلک

**سینەڕیز** / sineřîz/: ناو. سینەڕێز؛ ئاشق‌بەند 🇮🇷 سینەریز

**سینەڕێز** / sineřêz/: ☜ **سینەڕیز**

**سینەک** / sînek/: ناو. خاڵێکە لە پەڕی قومـاردا 🇮🇷 خالی در ورق بازی

**سینەکەمان** / sînekeman/: ناو. ڤیۆلۆن؛ ئامرازێکی مۆسیقایە 🇮🇷 ویلون

**سینەکێش** / sînekêş/: ناو. ۱. دەستەوهەوراز؛ ئاماڵ هەوراز ۲. کاری هەڵکێشانی دووکەڵ بۆ ناو سی و ڕاگرتنی و پاش ماوەیەک دەردانی ‹جگەرە ئەکێشی، لای کەم سینەکێشی مەکە!›. بەرانبەر: **دەمکێش** 🇮🇷 ۱. سربالایی ۲. سینەکش

**سینەم** / sînem/: ☜ **سیمەن**

**سینەما** / sînema/: ناو. ۱. بینایەک بە یەک یان چەند ژوورەوە بۆ شاندانی فیلم ۲. هونەر و پیشەی ساز کردنی فیلمی سینەمایی 🇮🇷 ۱و۲. سینما

**سینەمایی** / sînemayî/: ئاوەڵناو. ۱. پێوەندیدار یان سەر بە سینەما ۲. *[مەجاز]* ڕواڵەتی؛ تایبەتمەندی کار یان شتێ کە تەنیا بۆ نواندن و خستنە ڕوو دەکرێ ‹وەرە ماچم دەیە ماچی خودایی/ کە بێزارم لە ماچی سینەمایی «هێمن»› 🇮🇷 ۱. سینمایی ۲. ظاهری

**سینەمەکی** / sînemekî/: ☜ **سنامەکی**

**سینی** / sînî/: ناو. سینیک؛ تەوەق؛ تەباخ؛ بەرکەش؛ بەرگەش؛ مەعجۆمە؛ مەجومعە؛ مەجوعمە؛ مەجمەعە؛ مەجحمە؛ مەژمە؛ یالتەبەق؛ تەبسی؛ کەشەف؛ دەفرێکی تەخت و پەل بۆ لە سەر دانان و بردنی شتومەک بەتایبەت دەفری خواردن و خواردنەوە 🇮🇷 سینی

**سینیک** / sînîk/: ناو. دەوری؛ قاپی پەل 🇮🇷 دوری؛ بشقاب

**سینیماڵ** / sînîmał/: ئاوەڵناو. کاسەلێس؛ چڵکاوخۆر؛ نۆکەری بێگانە 🇮🇷 خودفروختە

**سیوا**[1] / sîwa/: ☜ **سەواد**

**سیوا**[2]: ئامراز. جگە؛ بێجگە؛ بێژگە ‹زامەت دووریت وە دڵ کەردەن کار/ سیوا جە مەردەن کەس نەبەردەن چار «بێسارانی»› 🇮🇷 جُز؛ بجُز

**سیوات** / sîwat/: ☜ **سەواد**

**سیواتدار** / sîwatdar/: ☜ **سەواددار**

**سیواتداری** / sîwatdarî/: ناو. خوێندەواری 🇮🇷 باسوادی

**سیواخ** / sîwax/: ☜ **سواخ**

**سیواد** / sîwad/: ☜ **سەواد**

⊡ **سیواد بوونەوە**: *[کینایە]* شەرم و شوورەیی وەلا نان و ڕووقایم بوون 🇮🇷 پررو شدن

**سیواغ** / sîwağ/: ☜ **سواخ**

**سیواق** / sîwaq/: ☜ **سواخ**

**سیواک** / sîwak/: ناو. چوکڵەیەکی باریکە سەرەکەی دەکوتن و موسوڵمان بۆ خاوێن کردنەوە لە دەمیانی وەردەدن 🇮🇷 مسواک چوبی

**سیواڵا** / sîwala/: ئاوەڵناو. ڕەش‌ئەسمەر؛ ڕەشتاڵە 🇮🇷 سیەچَردە

**سیوجگەر** / sî w c(i)ger/: ☜ **سووجگەر**

**سیوجەرگ** / sî w cerg/: ☜ **سووجگەر**

**سیورسات / sîwirsat/**: ناو. سوورسات؛ سووروسات؛ سێورسات 🇮🇷 سیورسات

**سیوسیوە / sîwsîwe/**: ناو. ١. تیوتیوە؛ تیفتیفە؛ کاری بریقە لێخستن ٢. بریقە؛ بریکە؛ سیقاڵ ٣. تەوەرەی بانگردێن 🇮🇷 ١. کار برق انداختن ٢. صیقل ٣. محور بامغلتان

**سیوشکە / sîwişke/**: ناو. ١. جۆرێ ژوژووی تیرهاوێژی وەکی چالەکەیە ٢. ئێسقا؛ ئاوبەند؛ نەخۆشی زگئاوسان 🇮🇷 ١. نوعی خارپُشت تیرانداز ٢. استسقا

◘ **سیوشکە گەیشتن**: ☜ سیوشکە هەڵاتن

**سیوشکە هەڵاتن**: سیوشکە گەیشتن؛ زۆر تینوو بوون ‹کورە سیوشکەم هەلات، بۆ خوا چۆرێ ئاو!› 🇮🇷 عطشناک بودن

**سیوڵ / sîwił/**: ناو. ١. ناو. سێول؛ سمێل؛ سوێل ‹وە جیب پر ڕیخ دەس وە تیکەوان/ .../ سیول جافر خان گریتە نیشان! «شامی»› ٢. توێڵ؛ هەنیە 🇮🇷 ١. سبیل ٢. پیشانی

**سیوم / s(i)yum/**: ☜ سیهەم

**سیومین / s(i)yumîn/**: ☜ سیهەمین

**سیوەیل / sîweyl/**: ☜ سوەیل

**سیویاگ / sîwyag/**: ☜ سواو[٢]

**سیویان / sîwyan/**: چاوگ. ساویان؛ سوان 🇮🇷 ساییده شدن

**سیویر / sîwîr/**: ناو. تاوێ کە پێست تاوانگاز دەکا 🇮🇷 تابش سوزندەی پوست

**سیە[١] / s(i)ye/**: ناو. ١. کێشێکە بەرانبەر بە دوو کیلۆ ‹سیەی گۆشتی› ٢. ڕەش 🇮🇷 ١. وزنی برابر دو کیلو ٢. رنگ سیاه

**سیە[٢]**: ئاوەڵناو. بەڕەنگی ڕەش 🇮🇷 سیاه رنگ

**سیەس / s(i)yes/**: ناو. مەیتەر؛ مەهتەر 🇮🇷 مهتر اسب

**سیەمین / s(i)yemîn/**: ☜ سیهەمین

**سیهک / sîhik/**: ☜ سرکە ـ٢

**سیهەم / sîhem/**: ئاوەڵناو. سییەم؛ سیوم؛ بە ڕیز، ڕزن، پلە یان جێگەی سییەوە 🇮🇷 سیام

**سیهەمین / sîhemîn/**: ئاوەڵناو. سیەمین؛ سیومین؛ سیهەم 🇮🇷 سیامین

**سییە / sîye/**: ☜ سیا

**سییەبەخت / sîyebext/**: ئاوەڵناو. کڵۆڵ؛ بەوبەخت 🇮🇷 بدبخت

**سییەپروسنەک / sîyeprûsnek/**: ☜ سیاپورسینگ

**سییەم / sîyem/**: ☜ سیهەم

**سێ[١] / sê/**: ناو. ١. یەک و دوو؛ ژمارەی سەرەکی پاش دوو، پێش چوار ٢. ناوی «س» پیتی پازدەهەمی ئەلفوبێتکەی زمانی کوردی ٣. سا؛ سێبەر 🇮🇷 ١. عدد سە ٢. نام حرف «س» ٣. سایە

**سێ[٢]**: دەنگ. هەستە؛ وشەی دنە دان لە هەڵپەڕکێدا 🇮🇷 اصطلاحی در تشویق بە رقص

**سێئەوەندە / sê'ewende/**: ☜ سێبەنە

**سێبارە / sêbare/**: ناو. سێبارەپات؛ دۆخی سێ جار پاتە کردنەوە 🇮🇷 سەبارە؛ تکرار برای سومین بار

**سێبارەپات / sêbarepat/**: ☜ سێبارە

**سێباری شەو / sêbarî şew/**: ناو. شەو درەنگان ‹سێباری شەو تێپەڕیبوو گەیشتمەوە ماڵ› 🇮🇷 نصف شب

**سێباز / sêbaz/**: ناو. سێبازد؛ سێلۆقی؛ گەمەیەکە بازی گەورەی تێدا ئەدەن 🇮🇷 پرش سەگام

**سێبازد / sêbazd/**: ☜ سێباز

**سێبرکە / sêb(i)řke/**: ناو. کاری بە سەر لە یەکتر دانی کەڵ و گا لە کاتی شەڕدا 🇮🇷 عمل کلە بە هم کوبیدن گاوها هنگام جنگ

**سێبزەمینی / sêbzemînî/**: ☜ سێفزەمینە

**سێبست / sêbist/**: ناو. ١. سێ پایەی ئاگردان ٢. *[پلار]* مرۆی کورتەباڵا 🇮🇷 ١. سەپایەی اُجاق ٢. آدم

کوتاەقد

**سێبسکۆک / sêbiskok/**: ناو. سێبسکە؛ گیلاخە؛ گیلاخە؛ گیایەکە دەگەڵ شێو دەکرێ ■ گیاهی که با آش می‌پزند

**سێبسکە / sêbiske/**: ☜ **سێبسکۆک**

**سێبنەهەرد / sêb(i)neherd/**: ☜ **سێوەبنعەرزیلە**

**سێبنهەرد / sêbinherd/**: ☜ **سێوەبنعەرزیلە**

**سێبەر[1] / sêber/**: ناو. ١. ساگات؛ سایە؛ سا؛ سێهک ٢. ☜ **سێبەردە** ■ ١. سایە ٢. ☜ **سێبەردە**

⊡ **سێبەر خستن**: سێبەر کردن: ١. بەر تیشکی ڕاستەوخۆی ڕووناکی گرتن ‹دارەکان سێبەریان خستبووە سەر ڕێگا› ٢. سێبەر شوێنێ داگرتن ٣. *[مەجاز]* شوێن خستن؛ شوێن دانان ‹شەڕ و قاتی، سێبەری خستە سەر وڵات› ٤. *[مەجاز]* زاڵ بوون ■ ١. سایە انداختن ٢. سایە شدن ٣. سایە انداختن ۴. چیرە شدن

**سێبەر درێژ بوون**: ☜ **سێبەر کشان**

**سێبەر کردن**: ☜ **سێبەر خستن**

**سێبەر کشان**: سێبەر درێژ بوون؛ ڕۆژ بەرەو کۆتایی چوون ‹کە کۆمەڵ ڕێکەوت بەرەو قەراخ/ سێبەر کشابوو بۆ پێدەشتی شاخ «گۆران»› ■ سایە بلند شدن

**سێبەری کەسێ لە سەر کەسێکیتر بوون**: حەوانەوە بە هۆی کەسێکیترەوە ■ سایەی کسی روی سر دیگری بودن

**سێبەر لێدان**: ١. پڕڕەنگ کردنەوەی بەشێک لە وێنە بۆ زیاتر دیار بوون ٢. سایە لێدان؛ ساوینی ماکێکی جوانکاری ڕەنگی، لە پشت چاو ■ ١و٢. سایە زدن

**لە ژێر سێبەری کەسێکدا بوون**: لە بەر پشتیوانی و پاڵپشتی کەسێکدا بوون ■ زیر سایەی کسی بودن

**وەک سێبەر بە دوی/ لە دوای/ لە شوێن کەسێکەوە بوون**: دوابەدوای کەسێک چوون و چاو لێ دانەخستن ■ مثل سایە دنبال کسی بودن

**سێبەر[2]**: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی زەوی یان ماڵێ کە دەوری لە سێ لاوە کۆڵان و شەقام بێ و نەکرێتەوە ■ سەبر

**سێبەردار / sêberdar/**: ئاوەڵناو. سادار؛ بە سێبەر ■ سایەدار

**سێبەردە / sêberde/**: ناو. سێبەر؛ سێکەڤر: ١. *[کنایە]* سێبەرک؛ سێتەلاقە ‹سێبەردە دەنێمە مستی بیری پیرم/ کیژی ڕەزی ڕووسووری ترێ مارە دەکەم «هەژار»› ٢. سێکوچکە؛ سێ بەرد بۆ چێکرنی کوانوو ■ ١. سە طلاقە ٢. سە سنگ اجاق

**سێبەرک / sêber(i)k/**: ☜ **سێبەردە ـ١**

**سێبەرۆ / sêbeřo/**: ناو. سێڕۆ؛ سێوەڕۆ؛ سێوەبەڕۆ؛ نۆبەتێ سێڕۆژە؛ یاوی سێ ڕۆژ جارێ ■ تب نوبەی سە روز در میان

**سێبەڕێ / sêbeřê/**: ☜ **سێپەڕ**

**سێبەسێ[1] / sêbesê/**: ناو. سێوەسێ؛ تەلاقی یەکجارەکی ■ نوعی طلاق بدون رجعت

**سێبەسێ[2]**: ئاوەڵناو. سێوەسێ؛ سیانی (تەلاق) ‹تەلاقی سێبەسێ خستووە› ■ سەتایی (طلاق)

**سێبەسێ[3]**: ئاوەڵکار. سێوەسێ؛ هەرسێک پێکەوە ‹سێبەسێ تەلاقی دا› ■ هرسە طلاق باهم

**سێبەگایە / sêbegaye/**: ناو. گای سێهەم بۆ نۆرە پێ کردن لە کێڵانی زەویدا ■ گاو یدکی برای شُخم

**سێبەلەک / sêbelek/**: ☜ **سێبەڕێ**

**سێبەند / sêbend/**: ناو. گای شەش ساڵە ■ گاو شش سالە

**سێبەندە / sêbende/**: ناو. سێونگی؛ ئێسکێکی سێگۆشە کە لە پێنج مۆرە پێکهاتووە و لە مرۆی گەورەدا پێکەوە دەلکێن دەکەوێتە نێوان کەمەر و کلێجە ■ دُنبالچە

**سێبەندی** / sêbendî/: ئاوەڵناو. داماڵیگ؛ بێ‌حەیا و شەرم ☰ بی‌شرم و آبرو

**سێبەنگی** / sêbengî/: ئاوەڵناو. سێوەنگی: ١. ڕەشی دڵپەسند و جوان (بۆ چاو و بڕۆی دەڵێن) ٢. سێ پەلکە (شێوە هۆنینەوەیەکی قژە سەرە) ‹دیدەکاڵ، لێوئاڵ، بسک سێبەنگی/ خاڵی سەر کولمەی ڕەشتر لە زەنگی «هێمن»› ☰ ١. مشکی دلربا (چشم) ٢. سەرشته (موی سر)

**سێبەنە** / sêbene/: ئاوەڵکار. سێ‌ئەوەندە؛ سێ‌قات ☰ سەبرابر

**سێپ** / sêp/: ناو. ١. دەستەندوو ٢. سێپە؛ کونی سێرەی تفەنگ ☰ ١. دستگیرەی خیش ٢. سوراخ مگسک تُفنگ

**سێ‌پا** / sêpa/: ناو. ١. سێ‌بست؛ سێ‌پایەی ئاگردان ٢. جۆرێ هەڵپەرکێ ٣. سێ‌پایەی مەشکە ☰ ١. سەپایەی اُجاق ٢. نوعی رقص گروهی ٣. سەپایەی مَشک

**سێ‌پاڵ** / sêpał/: ناو. کۆچکە ☰ هِرم

**سێ‌پاڵو** / sêpałû/: ئاوەڵناو. تاشراوی سێ‌سووچ ☰ سەپهلو

**سێ‌پایە** / sêpaye/: ناو. سێ‌پای ئاگردان ☰ سەپایەی اُجاق

**سێپرووسنەک** / sêprûsnek/: ☜ **سیاپورسینگ**

**سێپریسک** / sêprîsk/: ☜ **سیاپورسینگ**

**سێپل** / sêpil/: ناو. ڕچەی بەکۆمەڵی کورکوڕ و کەو ☰ دستەی انبوه باقرقره و کبک

**سێ‌پەڕ** / sêpeř/: ناو. پلووێن؛ گیاگۆچان؛ گیاوەگۆچانە؛ سێ‌بەڕێ ☰ اکلیل‌الملک

**سێپەرە** / sêpeře/: ناو. گیایەکە بە سێ بەرگەوە کە لەوەڕێکیشە ئاژەڵ زۆری پێ خۆشە ☰ گیاهی است

**سێپەرێ** / sêpeřê/: ناو. سێ‌وەرە؛ سێ‌وەرۆ؛ سێ‌بەڵەک؛ شەوەرە هەردی؛ گیایەکی کورتەباڵای کەوەیە، ئاژەڵ زۆر حەزی لێ دەکا ☰ شبدر وحشی

**سێپەک** / sêpek/: ناو. سێپایەی مەشکە ☰ سەپایەی مشک

**سێ‌پەل** / sêpel/: ئاوەڵناو. سێ‌شاخە ☰ سەشاخە

**سێپەلاک** / sêpelak/: ☜ **سی[1]-١**

**سێ‌پێ** / sêpê/: ناو. ١. سێ‌پا؛ سێ‌پێیی؛ جۆرێ ڕەقس ٢. سێ‌پا ☰ ١. نوعی رقص ٢. سەپایە

**سێ‌پێیی** / sêpêyî/: ☜ **سێ‌پێ-١**

**سێتا** / sêta/: ئاوەڵناو. سێ‌باد؛ سێ لا؛ بە شێوەی سێ داو پێکەوە بادراو ☰ سەلا

**سێ‌تار** / sêtar/: ناو. سازی ژێداری ئێرانی بە چوار تاڵەوە، کە پێشتر سێ تاڵی هەبووە و وەکوو تاری چکۆلەیە کە بە نینۆک دەژەندرێ ☰ سەتار

**سێتاڤ** / sêtav/: ناو. ١. سایەی مرۆ لە بەر خۆر ٢. تاپۆ؛ تارمایی ٣. خۆرەتاو ☰ ١. سایەی انسان در آفتاب ٢. شَبَح ٣. نور آفتاب

**سێتە** / sête/: ناو. ١. چیا؛ کێو ٢. پۆ؛ هەواڵی تاڵ ٣. سێتا؛ تەنافی سێ‌باد ☰ ١. کوە ٢. پود ٣. رسن سەلا

**سێتەک** / sêtek/: ناو. بەردەلان؛ ڕێخەلان ☰ سنگلاخ

**سێ‌تەلاقە[1]** / sêtełaqe/: ناو. *[ئیسلام]* سێ‌بەسێ؛ یەرەتلاقە ‹کابرا سێ‌تەلاقەی خست ئیدی بۆ ڕاو چەک هەڵنەگرێت› ☰ سەطلاقە

▣ **سێ‌تەلاقە خستن**: *[ئیسلام]* گوتنی سێ‌جارەی واتەی تەلاق کەوتن کە بە پێی دابی کۆمەڵگا و شەرع ژن و شوو لێک حەرام دەبن. هەروەها: **سێ‌تەلاقە بوونەوە؛ سێ‌تەلاقە دان؛ سێ‌تەلاقە دران** ☰ سەطلاقە را بر زبان آوردن

**سێ‌تەلاقە کەوتن**: *[ئیسلام]* کەوتنی یەکجارەکی تەلاقی کەسێ ☰ سەطلاقە جاری شدن

**سێ‌تەلاقە[2]**: ئاوەڵناو. *[ئیسلام]* سێ‌بەسێ؛ یەرەتلاقە؛

تەلاقدراوی یەکجاری کە ئیتر گرێ نەخواتەوە ■ سەطلاقە

**سێتەنگە** / sêtenge/: ناو. [پـلار] ورگـزل ■ شکم‌گنده

**سێجرتە** / sêcirte/: ☜ **سێجرتی**

**سێجرتەکی** / sêcirtekî/: ☜ **سێجرتی**

**سێجرتی** / sêcirtî/: ناو. سێجرتە؛ سێجرتەکی؛ سێرمەکێ؛ سیمرەکێ؛ هەڵبەز- دابەزی توند و کاری دەست و لاق خستنی نائاسایی ■ ورجه‌وورجه‌ی رقص مانند

**سێجگە** / sêcge/: ناو. جۆرێ قاپێن؛ جگێن ■ نوعی بازی با شتالنگ

**سێچاک** / sêçak/: ناو. کەوای شۆڕ کە سێ لای شاقەلەکەی هەڵدڕابێ ■ قبای سه‌چاک

**سێچکە** / sêçke/: ☜ **سوێسکە**

**سێ- چوار** / sê ç(i)war/: ناو. دوازدە ڕۆژی سەرە بەهار ■ دوازده روز اول بهار

**سێچوکڵ** / sêçukił/: ☜ **سێددانە**

**سێچوکڵە** / sêçukłe/: ناو. ١. سێ سووچ؛ سێگۆشە ٢. سێددانە ■ ١. سه‌گوش؛ مُثلث ٢. سه دندانه

**سێحاچە** / sêĥaçe/: ئاوەڵناو. ١. سێفلیقانە؛ سێلق ٢. لە سێ لاوە تاشراو ■ ١. سه‌شاخه ٢. سه‌پهلو

**سێخ** / sêx/: ناو. سیخ؛ شیش؛ شیشە ■ سیخ

**سێخچووڵی** / sêxçûłî/: ناو. بیاوان؛ بیابان؛ یاوان ■ بیابان

**سێدارە** / sêdare/: ناو. قەنارە؛ داری مرۆ پێ خنکاندن ■ دار اعدام

⊡ **لە سێدارە دان:** بە سێدارە کەسێ خنکاندن ■ دار زدن

**سێدانە** / sêdane/: ناو. ١. سێ جەم لەوەڕی ئاژەڵ ٢. ☜ **سێددانە** ■ ١. سه وعده خوراک دام ٢. ☜ **سێددانە**

**سێددان** / sêd(i)dan/: ☜ **سێددانە**

**سێددانە** / sêdidane/: ناو. سێ دانە؛ سێددان؛ سێدیانە؛ سێچکول؛ پەیکوڵ ■ خار سه‌کوهه

**سێدەری** / sêderî/: ناو. ژووری سێ پەنجەرە ■ اتاق سه پنجره

**سێدەندک** / sêdendik/: ناو. سێلک؛ شەنەی سێ حاچە ■ افشون سه شاخه

**سێدەنگان** / sêdengan/: ناو. کاری بە دەنگی بەرز بانگ کردن ■ عمل با صدای بلند صدا زدن

**سێدیانە** / sêd(i)yane/: ☜ **سێددانە**

**سێر**[1] / sêr/: ئاوەڵناو. تێر؛ مر ■ سیر

▪ **سێر**[2]: پاشگر. شوێن؛ سەرا ‹گەرمەسێر› ■ ـ سیر

**سێرت** / sêrt/: ناو. چقڵ؛ دڕک؛ دڕوو ■ خار

**سێرک** / sêrik/: ناو. سێ ڕۆژ ڕۆژووی ئێزدییەکان ■ سه روز روزه‌ی ایزدیان

**سێرۆچکە** / sêroçke/: ☜ **سوورێتچک**

**سێروو** / sêrû/: ناو. ڕەشۆڵە؛ ڕیشۆڵە؛ ڕەشوولە؛ ڕەشۆڵێ؛ ڕەشێلک؛ ڕەشێلە؛ ڕەقشێلە؛ ڕیشۆڵێ؛ سێکەرک؛ گاوانی؛ مریچەڕەشە؛ مەلەڕەشە؛ ڕەش‌چێلەک؛ مەلێکە نزیکی ٢٠ سانتی‌میتر دەبێ، پەڕ و باڵی ڕەشی بریقەدارە، دندووک و سەر و باڵی تیژە، زستانان پەڕ و باڵی خاڵخاڵ دەبێ، گەرووی سپی‌واشە، باڵندەیەکی بە قاژ و قوورە، توند و ڕاست دەفڕێ، بە گەل چینە دەکەن، پاییز و زستانان لە شوێنی بەرز دەنیشن و قیرە و قالیان ولات پڕ دەکا ■ سار

**سێرووبەڵەکە** / sêrûbełeke/: ☜ **سێرووخەزاڵە**

**سێرووخەزاڵە** / sêrûxezałe/: ناو. خەزایی؛ سێرووبەڵەکە؛ ئاگرمەلووچ؛ ئایلەمەن؛ ئاینەمەل ■ سار صورتی.

**سێرە** / sêre/: ناو. ١. سیپە؛ قوتەی سەر لوولەی تفەنگ ٢. ماوەی ژیان؛ زیندی سەر ٣. سەیرە ■

١. مگسک تُفنگ ٢. مدت زمان زندگانی ٣. سُهره
◘ **سێره دان:** نیشانە گرتن ‹ئەو زەرد و سوورە پۆڕی گولان/ یا پۆلی بێری داویانە سێرە؟ «؟»› ☰ نشان گرفتن
**سێره هەڵگیران:** تاریک داهاتنی هەوا ‹هەتا سێره هەلگیرا، شەڕ هەر بەردەوام بوو «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ تاریک شدن هوا

**سێڕسکێن / sêřiskên/:** ناو. یارییەکی دوو کەسییە، بە شەش داش دەکرێ، یەکیان سێ بەرد هەڵدەگرێ و ئەوی‌تریان سێ چیلکە، وەک دامە وایە ☰ از بازی‌ها

**سێڕمەکی / sêř(i)mekî/:** ☜ **سێجرتی**

**سێڕۆ / sêřo/:** ☜ **سێبەڕۆ**

**سێڕۆژانە / sêřojane/:** ناو. سێڕۆژە: ١. بەزم لە ماڵی زاوا دوای سێ ڕۆژ لە بووک گوێزانەوە ٢. ڕێوڕەسمێ کە لە ڕۆژی سێهەمی کۆچی دوایی کەسێک بەڕێوە دەچێت ‹کە مـن مـردم لـە سـەر قەبرم گریە و زاریم بۆ چییە؟/ سێڕۆژانە و حەڵوا بەخشین، دار و بێداریم بۆ چییە؟ «گۆرانی»› ☰ ١. سور سوم روز عروسی در خانەی داماد ٢. مراسم روز سوم درگذشت کسی

**سێڕۆژگانە / sêřojgane/:** ☜ **سێڕۆژە ـ١**

**سێڕۆژە / sêřoje/:** ناو. ١. سێڕۆژگانە؛ هەڵوای مردوو دوای سێ ڕۆژ ٢. ☜ **سێڕۆژانە** ☰ ١. حلوای روز سوم ترحیم ٢. ☜ **سێڕۆژانە**

**سێڕیزکانێ / sêřîzkanê/:** ناو. سێڕیزکێن؛ چووزان؛ گەمەیە دووکەسی، هەر یەکە سێ بەردی پچووک دادەکەن، وەک دامە وایە ☰ دوزبازی

**سێڕیزکێن / sêřîzkên/:** ☜ **سێڕیزکانێ**

**سێڕیان / sêřyan/:** ☜ **سێڕێیان**

**سێڕیانی / sêřyanî/:** ☜ **سێڕێیان**

**سێڕێیان / sêřêyan/:** ناو. سێڕیان؛ سێڕیانی؛ سێڕێیانی؛ سەری سێ ڕێگە کە دەگەنە یەک ☰ سەراهی

**سێڕێیانی / sêřêyanî/:** ☜ **سێڕێیان**

**سێزدە / sêzde/:** ☜ **سیانزە**

**سێزدەبەدەر / sêzdebeder/:** ناو. سیانزەوەدەر؛ ڕۆژی سێزدەهەمی خاکەلێوە کە جێژنێکی کۆنی ئێرانییە و خەڵک لەو ڕۆژەدا بەگەشتی دەچنە سەیران ☰ سیزدەبەدر

**سێزدەمین / sêzdemîn/:** ☜ **سیازدەهەمین**

**سێزدەهەم / sêzdehem/:** ئاوەڵناو. سیانزەهەم؛ بە ڕیز، پلە یان جێگەی سێزدەوە ☰ سیزدهم

**سێزدەهەمین / sêzdehemîn/:** ☜ **سیازدەهەمین**

**سێزن / sêzin/:** ناو. شەنە؛ شەن ☰ افشون

**سێزوو / sêzû/:** ناو. سبەی؛ سبحەی؛ سۆزی ☰ فردا

**سێزە / sêze/:** ☜ **سیانزە**

**سێژەمە / sêjeme/:** ئاوەڵکار. لە سێ ژەمی بەیانی، نیوەڕۆ، شێوان ‹سێژەمە نان دەخۆم› ☰ سه وعده

**سێست / sêst/:** ناو. شەست؛ شەس؛ شەیشتی؛ شەش چەل دە ☰ شصت

**سێسکە / sêske/:** ☜ **سوێسکە**

**سێسو / sêsû/:** ناو. ١. گیایەکی ڕەقە لە زەلکاو دەڕوێ سێ سووچی هەیە ٢. بڕبەند؛ ڕنەک ☰ ١. گیاهی بلند و سه گوشه کە در باتلاق می‌روید ٢. سوهان

**سێسووچ / sêsûç/:** ناو/ ئاوەڵناو. سێ چوکڵە؛ سێقولینچک ☰ سەگوش؛ مُثلث

**سێسەد[1] / sêsed/:** ناو. ژمارەی سەرەکی نێوان دووسەد و نەوەد و نۆ و سێسەد و یەک ☰ سیصد

**سێسەد[2]:** ئاوەڵناو. دانەیەک زیاتر لە دووسەد و نەوەد و نۆ دانە ☰ سیصد

**سێسەدم / sêsedim/:** ☜ **سێسەدەم**

**سێسەدمی** / sêsed(i)mî/: ☜ **سێسەدەم**

**سێسەدەم** / sêsedem/: ئاوەڵناو. سێسەدەم؛ بە ڕیزمان یان پلە و جێگای سێسەدەوە ☲ سیصدم

**سێسەدەمی** / sêsedemî/: جێناو. سێسەدمی؛ ئەوەی لە ڕیز، پلە یان جێگای سێسەدەمدایە ☲ سیصدمی

**سێسەدەمین** / sêsedemîn/: ئاوەڵناو. بە ڕیز یان پێگەی سێسەدەمەوە ☲ سیصدمین

**سێسەر** / sêser/: ناو. یەکبەسێ (وەک: سەرێک ترێ بە سێ سەر گەنم) ☲ معاوضەی یک به سه

**سێسەری** / sêserî/: ناو. گیایەکە زۆرتر لە ناو گەنما شین دەبێ ☲ گیاهی است

**سێسیخە** / sêsîxe/: ناو. ۱. سێچوکڵە؛ سێکونج ۲. سێلکە؛ سێلق ۳. سێپاڵوو؛ داری لە سێلاوە تاشراو ☲ ۱. سەگوشه ۲. سەشاخه ۳. چوب سەپهلو تراشیده

**سێسێ** / sêsê/: ئاوەڵکار. سیانسیان ☲ سەتا سەتا

**سێشاخە** / sêşaxe/: ئاوەڵناو. سێپە ☲ سەشاخه

**سێشەش** / sêşeş/: ناو. هەژدە ڕۆژی سەرەتای خاکەلێوە ☲ هجده روز اوّل فروردین ماه

**سێشەم** / sêşem/: ☜ **سێشەممە**

**سێشەمب** / sêşemb/: ☜ **سێشەممە**

**سێشەمبۆ** / sêşembo/: ☜ **سێشەممە**

**سێشەمبوو** / sêşembû/: ☜ **سێشەممە**

**سێشەمبی** / sêşembî/: ☜ **سێشەممە**

**سێشەممۆ** / sêşemmo/: ☜ **سێشەممە**

**سێشەممە** / sêşemme/: ناو. سێشەم؛ سێشەمب؛ سێشەمبۆ؛ سێشەمبوو؛ سەشەمبی؛ سێشەممۆ؛ سێشەمە؛ سێشەمۆ؛ سێشەمی؛ ناوی ڕۆژی چوارەمی حەفتەی ئێرانی نێوان دووشەممە و چوارشەممە ☲ سەشنبه

**سێشەمۆ** / sêşemo/: ☜ **سێشەممە**

**سێشەمە** / sêşeme/: ☜ **سێشەممە**

**سێشەمی** / sêşemî/: ☜ **سێشەممە**

**سێف** / sêf/: ☜ **سێو-۱**

**سێفتۆ** / sêfto/: ئاوەڵناو. بۆگەن؛ بۆن ناخۆش ☲ بدبو

**سێفزەمینە** / sêfzemîne/: ناو. سێفەزەوینە؛ سێفەزەمینە؛ سێفزەمینی؛ سێفەزەمینی؛ سێبزەمینی؛ سێفەعەرزیلە؛ سێفی؛ سێڤەڕۆک؛ سێوک؛ سێوخاکی؛ کارتێنە؛ کارتۆڵ؛ کەرتوف؛ کەرتۆپە؛ کرتۆپل؛ کرتۆفل؛ کارتۆفل؛ کەرتۆفل؛ کرتوپ؛ کرکرووک؛ پەتاتە؛ پتات؛ پتەپتە؛ پوتێتە؛ پتێتە؛ پاکە-پاکە؛ خڕکەگازوولە؛ ڕتاخ؛ هێلەماسی؛ هێرەلماسی؛ هێلەرماسی؛ یارەلماسی: ۱. گیایەکی ئالیکی بە لکی ژێرخاکییەوە کە چووزە دەردەکا و گوڵی بنەوشی ڕوون یان سپی و بەکۆمەڵ بە شێوەی هێشووی چەتراسا، گەڵای لێکدراو و میوەی خڕ و سوور دەدا ۲. سەلکی ژێرزەوینی ئەو گیایە کە تڕی لە نشاستەیە و خۆراکێکی جیهانییە ☲ ۱و۲. سیبزمینی

**سێفزەمینی** / sêfzemînî/: ☜ **سێفزەمینە**

**سێفلیقانە** / sêf(i)lîqane/: ئاوەڵناو. سێحاچە؛ سێفلیقانە؛ سێلق ☲ سەشاخه

**سێفەتاڵە** / sêfetałe/: ☜ **سێوەتاڵە**

**سێفەتورشە** / sêfeturşe/: ☜ **سێوەترشە**

**سێفەزەمینە** / sêfezemîne/: ☜ **سێفزەمینە**

**سێفەزەمینی** / sêfezemînî/: ☜ **سێفزەمینە**

**سێفەزەوینە** / sêfezewîne/: ☜ **سێفزەمینە**

**سێفەسوورە** / sêfesûre/: ☜ **سێوەسوورە**

**سێفەعەرزیلە** / sêfe'erzîle/: ☜ **سێفزەمینە**

**سێفەکێویلە** / sêfekêwîle/: ناو. سێڤەڕەشک ☲ سیب وحشی

**سێفەڵوکە** / sêfełûke/: ناو. سێوەڵووکە؛ گیایەکە بەرێکی وردی خڕی سپی دەگرێ و دەخورێ ☲ گیاهی خوردنی با ثمر گرد و کوچک و سفید

**سێڤی** / sêfî/: ☜ **سێفزەمینە**

**سێڤ** / sêv/: ☜ **سێو-١**

**سێڤاسۆتک** / sêvasotik/: ناو. زیپکەیەکە زۆر بە ژان و دیاریش نییە ▤ جوشی دردناک و ناپیدا

**سێڤاندۆک** / sêvandok/: ☜ **ساندیلکە**

**سێڤاندۆکە** / sêvandoke/: ☜ **ساندیلکە**

**سێڤاندە** / sêvande/: ☜ **سوانە**

**سێڤاندیلکە** / sêvandîlke/: ☜ **ساندیلکە**

**سێڤڕەشک** / sêvřeşk/: ناو. سێفەکێویلە ▤ سیب وحشی

**سێڤسێڤۆک** / sêvsêvok/: ناو. پیازەخووگانە ▤ پیاز دشتی

**سێڤلە** / sêvle/: ناو. جرج؛ مشکەکوێرە ▤ موش صحرایی

**سێڤی** / sêvî/: ☜ **سێوی**

**سێقات** / sêqat/: ئاوەڵکار. سێبەنە؛ سێئەوەندە ▤ سەبرابر

**سێقنگ** / sêqing/: ☜ **کنیواڵ**

**سێقولینچک** / sêqulînçik/: ناو. سێسووچ؛ سێ چوکڵە ▤ سەگوش؛ مُثلث

**سێک** / sêk/: ☜ **سرکە-٢**

**سێکانس** / sêkans/: ناو. زەنجیرە دیمەنی یەک لە دوای یەکی فیلم، کە بابەت یان ڕووداوێکی دیاریکراو نیشان دەدا و بە ڕوون بوونەوەی بەرە ـ بەرەی، دیمەن دەسپێدەکا و بە تاریک بوونەوەی کۆتایی دێت ▤ سکانس

**سێکس** / sêks/: ناو. پێوەندی جینسی ▤ سکس

**سێکسی** / sêksî/: ئاوەڵناو. ١. پێوەندیدار بە کار و باری جنسی ‹دەسدرێژی سێکسی› ٢. هۆکاوی؛ بزوێنەری ئارەزووی جنسی ‹وێنەی سێکسی› ▤ ١و٢. سکسی

**سێکوچک** / sêkuçik/: ☜ **سێ کوچکە**

**سێکوچکە** / sêkuçke/: ناو. سێ کوچک: ١. سێبەردی ئاگردان ٢. *[مەجاز]* سێ‌هەواڵی هاوڕێ ‹سێ کوچکەی سەفەری بارانین: مەولانە و حاجی و من «شێرکۆ»› ▤ ١. سەسنگ اجاق ٢. سە همراه همدل

**سێکوچکێن** / sêkuçkên/: ناو. گەمەیەکە سێ زارۆ دەیکەن ▤ از بازی‌های سە نفرەی کودکانە

**سێکونج** / sêkunc/: ناو. سێسیخە؛ سێ چوکڵە ▤ سەگوشە

**سێکۆچە** / sêkoçe/: ناو. سێسووچ؛ سێ گوشە ▤ مُثلث

**سێکوزە** / sêkûze/: ناو. گیایەکە لە ئاودا دەبێ ▤ گیاهی مردابی

**سێکەرک** / sêkerk/: ناو. ڕەشۆڵە؛ گاوانی ▤ سار

**سێکەڤر** / sêkevr/: ☜ **سێبەردە**

**سێکەهر** / sêkehr/: ناو. بزنێ سێ کاریلەی بە زگێک بووبێ ▤ بُزی کە سەقلو زاییدە

**سێگا** / sêga/: ناو. یەک لە حەو دەزگای مووسیقای ئێرانی ▤ دستگاه سەگاه در موسیقی ایرانی

**سێگاسنە** / sêgasne/: ئاوەڵناو. ونار؛ سێ جار شێف براو (شیو) ▤ سە بار شخم‌شدە (زمین)

**سێگاڤ** / sêgav/: ناو. گەمەی کەوشەک؛ سێ باز ▤ بازی سەگام

**سێگۆش** / sêgoş/: ☜ **سێ گۆشە**

**سێگۆشە**[1] / sêgoşe/: ناو. سێسووچ؛ سێ گۆش؛ یەکێک لە شکڵە بنەماییەکانی هەندەسەیە بە سێ کونج و سێ پەلەوە ▤ مُثلث

**سێگۆشە**[2]: ئاوەڵناو. سێ گۆش؛ بە سێ سووچەوە ▤ مُثلثی

**سێل** / sêl/: ناو. ١. سێڵ؛ سێهل؛ ساج ٢. سەیر؛ تواشا ▤ ١. ساج ٢. تماشا

**سێلاخ** / sêlax/: ناو. ڕەڵمێ کە لافاو ڕایداوە و داویەتە ڕەخی ڕووبارەوە ▤ ماسەی سیل‌آوردە

**سێلق** / sêliq/: ئاوەڵناو. سێحاچە؛ سێسیخە؛ سێفلیقانە ☰ سەشاخە

**سێلک** / sêlik/: ناو. شەنی سێددانەی داریـن ☰ افشان چوبین سە شاخە

**سێلکە** / sêl(i)ke/: ئاوەڵناو. سێحاچە ☰ سەشاخە

**سێلگا** / sêlga/: ☜ **سێلاوگر**

**سێلمی** / sêlmî/: ناو. هەڵوایەکە لە ئارد و پەنیر و دۆشاوی دەکەن ☰ نوعی حلوا

**سێلۆقی** / sêloqî/: ☜ **سێباز**

**سێلوولە** / sêlûle/: ناو. خشڵێکی ژنانە ☰ زیـوری است

**سێلەک** / sêlek/: ناو. شۆرەکات؛ زەوینێ کە خوێی تێکەڵاوە ☰ شورەزار

**سێلیڤ** / sêlîv/: ئاوەڵناو. [پەلار] لچقەوی؛ لۆچوو؛ لەوسن؛ وشترلچ؛ لەوس پان ☰ لب‌چور؛ لب‌شتری

**سێلێڤ** / sêlêv/: ئاوەڵناو. ١. لچئەستوور ٢. کەل؛ کەتە؛ قەشاف ☰ ١. لب‌کلفت ٢. لب‌شکری

**سێڵ** / sêł/: ناو. سێل؛ سێهل؛ ساج ☰ ساج

**سێڵاو** / sêław/: ناو. لافاو؛ لەهی؛ لی؛ ئاوی زۆر بە تەوژم کە پاش باران بەر دەبێتەوە ☰ سیلاب

**سێڵاوگر** / sêławgir/: ناو. سێلگا؛ شیو و کەندێ کە لافاوی پێدا دێت ☰ مسیل

**سێڵە** / sêłe/: ناو. بەردی نان لە سەر پێژان ☰ سنگ نان‌پزی (بە جای ساج)

**سێمین** / sêmîn/: ئاوەڵناو. سێهەمین؛ لە ڕیز یان پلەی سێهەمدا ‹ئەمە سێمین جارە دێم› ☰ سومین

**سێمینە** / sêmîne/: ئاوەڵناو. سێینە؛ بۆ جاری سێهەم ‹پژمەی سێمینە دەڵێن باشە› ☰ سومین

**ـ سێن** / sên-/: پاشگر. ـــ ئەستێن: ١. سێنەر ‹مەڕسێن› ٢. ـ گیر ‹باجسێن› ☰ ١. ـ خر؛ خریدار ٢. ـ ستان

**سێنج** / sênc/: ناو. پەرژین؛ چیلە ☰ پرچین

**سێنزە** / sênze/: ☜ **سیانزە**

**سێنەر** / sêner/: ئاوەڵناو. ١. وەرگر ٢. بسێن؛ کڕیار ☰ ١. گیرندە ٢. خریدار

**سێنیک** / sênîk/: ☜ **سینی**

**سێو** / sêw/: ناو. ١. سام؛ ساو؛ سێڤ؛ سێڤ؛ دارێ بە گوڵی چەتری، گەڵای کوڵکن و گەورەوە ٢. سێف؛ سێڤ؛ بەری ئەو دارە کە میوەیەکی خڕ، درشت، خۆراکی، ئاودار و شیرین یان ترش و شیرینە و چەن جۆری هەیە ٣. ژەنگەسوورە؛ سوورەمۆزە ☰ ١و٢. سیب ٣. زنبور سرخ

▣ **سێوی بن عەرز**: ☜ **سێوەبنعەرزیلە**

**سێوخاکی** / sêwxakî/: ☜ **سێفەزەمینە**

**سێودوو** / sê w dû/: ناو. [کنایە] ١. دوودڵی؛ دڕدۆنگی ‹مەلا محەممەد ـ کە نسحەتی ئێمەی کردبوو ـ سەری لە بن لێفە هەڵێنا و بێ سێودوو گوراندی ... «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. بیر و ڕا ‹لە سێودووی ئەو قسەدا بووین› ☰ ١. تردید؛ دودلی ٢. اندیشە

▣ **سێودوو کردن**: تێڕامان؛ تێفکرین؛ لە هەموو بارێکەوە بیر لێ کردنەوە ‹بێ سێودوو کردن دەفتەرەکانی دیوانە جوانەکەم ئاگر تێبەردان و خۆم لە شیعر و شاعیری تەرە کرد و ببڕای ـ ببڕای ئاوڕم وە سەر نەدایەوە «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ فکر کردن

**سێوڕاندن** / sêw(i)randin/: چاوگ. ئافراندن؛ خولقاندن ☰ آفریدن

**سێورسات** / sêwirsat/: ☜ **سیورسات**

**سێوک** / sêwik/: ناو. ١. ☜ **سێفەزەمینە** ٢. ☜ **سێوەبنعەرزیلە**

**سێوڵ** / sêwił/: ناو. سیوڵ؛ سمێل؛ سوێل ☰ سبیل

**سێونگ**[1] / sêwing/: ناو. سێوەنگ؛ سیاونە؛ گۆشتی بزن ☚ گوشت بُز

**سێونگ**[2]: ناوەڵناو. سێوەنگ؛ ڕەشانگ؛ ڕەش (بزن) ☚ موسیاه (بُز)

**سێونگی** / sewingî/: ☜ سێبەندە

**سێوە** / sêwe/: ☜ سێوی

**سێوەبنعەرزیلە** / sêwebin'erzîle/: ناو. سێبنهەرد؛ سێبنەهەرد؛ سێوی بن عەرز؛ سێوک؛ بنە گیایەکە لە پەتاتە دەکا و بە کاڵی دەیخۆن ☚ سیبزمینی ترشی

**سێوەبەڕۆ** / sêwebeřo/: ☜ سێوەڕۆ

**سێوەتاڵە** / sêwetałe/: ناو. سێفەتاڵە؛ جۆرێ سێوی خۆڕسکی وردی تاڵی کێوی ☚ سیب تلخ وحشی

**سێوەترشە** / sêwetirşe/: ناو. سێفەتورشە؛ جۆرێک سێوی ورد و ترشی خۆڕسکی کێوی ☚ سیب تُرش وحشی

**سێوەختە**[1] / sêwexte/: ناو. بەیان و نیمەڕۆ و شەو ☚ صبح و ظهر و شب

**سێوەختە**[2]: ناوەڵناو. سێ بەهار دیتوو ☚ سە بهار دیدە

**سێوەختە**[3]: ناوەڵکار. لە بەیان و نیمەڕۆ و شەودا ☚ در سە وعدەی صبح و ظهر و شام

**سێوەر** / sêwer/: ناو. سا؛ سایە؛ سێبەر ☚ سایە

**سێوەرمێ** / sêwermê/: ناو. سێوهەرمێ؛ جۆرێ هەرمێ ☚ نوعی گلابی

**سێوەرە** / sêwere/: ☜ سێبەرێ

**سێوەڕۆ** / sêweřo/: ☜ سێبەڕۆ

**سێوەڕە** / sêweře/: ☜ سێبەڕێ

**سێوەسوورە** / sêwesûre/: ناو. سێفەسوورە؛ سێوەلاسوورە؛ جۆرێ سێوی سوور ☚ سیب سُرخ

**سێوەسێ** / sêwesê/: ☜ سێبەسێ

**سێوەلاسورە** / sêwelasûre/: ☜ سێوەسورە

**سێوەڵوکە** / sêwełûke/: ☜ سێفەڵوکە

**سێوەنگ** / sêweng/: ☜ سێونگ

**سێوەنگی** / sewengî/: ☜ سێبەنگی

**سێوهەرمێ** / sêwhermê/: ☜ سێوەرمێ

**سێوی** / sêwî/: ناوەڵناو. سێڤی؛ سێوە؛ هەتیو؛ هەتیم؛ دای و باب مردوو ☚ یتیم

**سێویان** / sêwyan/: چاوگ. سوانەوە؛ ساویانەوە ☚ سایدە شدن

**سێویخانە** / sêwîxane/: ناو. جێگای منداڵانی هەتیو ☚ یتیمخانە

**سێه** / sêh/: ناو. ١. سا؛ سایە؛ سێوەر؛ سێبەر ٢. ڕک؛ تووڕەیی ٣. چەرمی وشکهەڵاتوو ☚ ١. سایە ٢. خشم ٣. چرم خُشکشدە

⊡ **سێهڕا بوون**: ڕک هەستان؛ تووڕە بوون ☚ بە خشم آمدن

**سێهک** / sêhik/: ☜ سێبەر[1]_١

**سێهل** / sêhil/: ناو. سێل؛ سێڵ؛ ساج ☚ ساج

**سێهەم** / sêhem/: ناوەڵناو. سێیەم؛ سێمینە؛ یەرەم؛ یەروم؛ هیرن؛ هیرین؛ هیرینە؛ بە ڕیز، ڕزن، پایە یان جێگەی سێوە ☚ سوم

**سێهەمین** / sêhemîn/: ناوەڵناو. هیرێیەن؛ هیرسن؛ پاش دووهەمین ☚ سومین

**سێینە** / sêy(i)ne/: ☜ سێمینە

**سێیە** / sêye/: ناو. ڕەش؛ سیاو؛ سیە؛ ڕەنگی خەڵووز یان ئاسمانی شەوی تار ☚ سیاە

**سێیەک** / sêyek/: ناو. لە سێ پاژ پاژێک ☚ ثلث؛ یک سوم

**سێیەکبەر** / sêyekber/: ناو. سەپانێ کە لە بەهرە سێیەک دەبا ☚ کشاورزی کە یک سوم محصول را میبرد

**سێیەم** / sêyem/: ☜ سێهەم

**سێیینە** / sêyîne/: ☜ سیانە

# ش

**ش**[1] / ş/: پـیت. نیشـانەی شـازدەهەمین پـیتی ئـەلفوبێـی زمـانی کـوردی ☰ ش؛ نشـانەی شانزدەهمین حرف الفبای زبان کُردی

**ش**[2]: جێناو. ۱. جێنـاوی لکـاوی ملـکی، سـێهەم کەسی تاک ‹یانەش؛ بەشەش› ۲. جێناوی لکاوی بەرکاری، سێهەم کەسی تاک ‹بەرووش؛ موەریش› ۳. جێناوی لکاوی فاعیلی، سێهەم کەسـی تـاک ‹داش؛ مـاڕاش› ☰ ۱. ضـمیر متصـل ملکـی سـوم شخص مفرد ۲. ضمیر متصل مفعولی سـوم شـخص مفرد ۳. ضمیر متصل فاعلی سوم شخص مفرد

**ش**[1] / şi/: ناو. ناوی پیتی شازدەهەمی ئـەلفوبێـی کوردی ☰ ش؛ حرف شانزدهم الفبای کُردی

**ش**[2]: ناوەلکار. ۱. چ؛ چی ‹ش دەکـەی؟› ۲. هـیچ ‹ش ناکەم› ☰ ۱. چه ۲. هیچ

**ش**[3]: سارستە. ۱. شا؛ تەماشا بکە؛ سەیر بکە (وێـڕای سەرسووڕمان یان سووکایەتی) ‹ش! چـی ئـەکا بـەو ماڵە!› ۲. هێواش؛ ئارام ‹ش! دەنگ مەکـە!› ☰ ۱. باش ۲. آرام باش

**ـ ش** / -iş/: پاشگر. شـت؛ نیشـانەی نـاوی چـاوگ ‹بڕش› ☰ پسوند نشانەی اسم مصدر

**شا**[1] / şa/: نـاو. شـاه: ۱. پاڵشـا؛ پادشـا ۲. داشـەگەورەی شـەترەنج ۳. پـەڕێکی وەرەق ٤. داکی مێشەنگوینان ☰ ۱. شـاه ۲. شاه شـطرنج ۳. شاه؛ از برگ‌های ورق ۴. ملکەی زنبور عسل

⊡ **شا بە سەپانی خۆ نەزانین**: ☜ **سەپان ـ۲**

**شا**[2]: ☜ **شاد**

⊡ **شا بون**: ☜ **شاد بون**

**شا بونەوە**: ☜ **شاد بونەوە**

**شا**[3]: سارستە. ۱. خۆزی؛ خۆزگە ‹شا بە حاڵـت!› ۲. تەماشا بکە؛ بڕوانە؛ وردەو ‹شا چاوی؛ شـا لـووتی› ☰ ۱. خوشا ۲. باش؛ ببین

**شا**[4]ـ: پێشوشـە. ۱. زل؛ گەورە ‹شاتوو؛ شاباز؛ شـامار› ۲. شیاوتر؛ هێژا ‹شاسـوار› ۳. سـەرە ‹شـاژن› ٤. سـەرەکی ‹شـالوولە› ☰ ۱. بـزرگ ۲. شایسـته ۳. برجسته ۴. اصلی

**شاباجی** / şabacî/: نـاو. خوشـکی مێـرد؛ دش ☰ خواهرشوهر

**شابادی** / şabadî/: ☜ **شابادیە**

**شابادیە** / şabad(i)ye/: نـاو. شـابادی؛ دەفـری گەورەی دارین ☰ بادیەی بزرگ

**شاباز** / şabaz/: ناو. شـاواز؛ بـازی قـزل؛ تـەڕلان؛ تـەللان؛ مەلێکـە لـە تۆرەمـەی هەڵـۆ، خێـزانی بازەکان، ٥٠ تا ٦٠ سانتی‌میتر دەبێ، باڵی پـان و نووک تیژە، بـرۆی سـپییە، بـە تونـدی بـە سـەر داراندا دەفڕێ و باڵندان ڕاو دەکا ☰ طرلان

**شاباش**[1] / şabaş/: ناو. شاواش؛ شاواز؛ شـۆباش: ۱.

پووله؛ زەڕئەوشان؛ زەڕەوشان؛ پارەیێ کە لە زەماوەندا ئەیکەنە سەر بووک و زاوا یان ئەوی هەڵدەپەڕێ ٢. خەلات؛ دیاری؛ پێشکەشی ‹شاباشی تۆ بان گولالانی مەست/ سەیدی خارخاسەن بگیرۆ نە دەست «سەیدی»›. هەروەها: **شاباش کردن؛ کردنە شاباش** ≋ ١و٢. شاباش

**شاباش**[٢]: سارستە. شاواش؛ شاواز؛ شۆباش؛ ئافەرین؛ مەرحەبا ‹شاباش جەی تاقەت مەن بەی دەردەوە/ بەی دەرد دەروون سڕ جە پەردەوە «بێسارانی»› ≋ آفرین

**شاباڵ / şabał**/: ناو. ١. پەڕە گەورەکانی باڵی مەل ٢. ئەندازەی لە سەر پەنجە تا ئەستۆ ≋ ١. شهپر پرنده ٢. اندازەی از سرپنجه تا گردن

**شابان / şaban**/: ناو. کولەمانگ؛ هەشتەمین مانگی ساڵی کۆچی ـ مانگی ≋ ماه شعبان

**شابانە / şabane**/: ناو. شاوانە؛ گیایەکە ≋ شابانک

**شابست / şabist**/: ناو. بستی نێوان تەوەرە و پەڕی ئاسیاو ≋ میلەی رابط قطب و پرەی آسیا

**شابسک / şabisk**/: ☜ **شاکەزی**

**شابلۆن / şablon**/: ناو. کلیشە؛ کەرەسەیەک بە شێوەی پەڕەیەکی کانزایی یان پلاستیکی بە کون و درزی بە شێوەی پیت، ژمارە یان شکڵی جۆراوجۆرەوە، بۆ نووسینی پیت، ژمارە، ئەندازەگرتنی سەری مەتە و... ≋ شابلُن

**شابۆر / şabor**/: ناو. بڕبەن؛ کەرستەیەک بۆ لابردنی پرزە و وردە لکی سەر کانزا ≋ شابُر

**شابۆڕی / şaboȓî**/: ناو. شالوولە ≋ شاەلولە

**شابۆق / şaboq**/: ناو. لقەگەورەی دار ≋ بزرگترین شاخەی درخت

**شابو / şabû**/: ناو. شاپوو؛ کوندەگایە؛ بم؛ مەلێکە لە تۆرەمەی کوند، ٦٥ تا ٧٠ سانتیمیترە، گەورەترین تۆرەمەی کوندە، دوو دەستە تووک وەک شاخ لە سەریدا ڕواوە، پشتی زەردی ئامال قاوەییە و دەتوانێ گیانداری گەورەی وەک کەروێشک ڕاو بکا ≋ شاەبوف

**شابەڕو / şabeȓû**/: ناو. شابەلوو؛ کەستانە؛ بەڕووەخاسە؛ قسقە: ١. ناوی گشتی چەن جۆرە درەختی گەورە لە تیرەی پیاڵەداران کە بەرێکی شیرین و بۆنخۆشیان هەیە ٢. کۆپەک؛ بەری داری شابەڕوو کە لە ناو پیاڵەئاسایەکی دڕکاویدایە و خواردەمەنییە ≋ ١. شاەبلوط ٢. میوەی شاەبلوط

**شابەز / şabez**/: ناو. گەورە بازرگانی شار؛ سەرۆکی بازرگانان ≋ بزرگ بازرگان

**شابەلو / şabelû**/: ☜ **شابەڕو**

**شابەندەر / şabender**/: ناو. شابەنەر: ١. قونسوور؛ بەردەستی باڵوێز لە وڵاتی بێگانە ٢. *[مەجاز]* مرۆی بێشەرم و زمانددرێژ ≋ ١. کنسول ٢. آدم زباندراز بیشرم

**شابەنگ / şabeng**/: ناو. بۆژانە سیاوە ≋ گیاهی است

**شابەنەر / şabener**/: ☜ **شابەندەر**

**شابەیت / şabeyt**/: ناو. تەڵ؛ بەهێنچامە؛ باشترین و جوانترین بەیتی پارچە شیعرێک ≋ شاەبیت

**شابی / şabî**/: ناو. بیمیشک؛ بیمشک؛ ڕەشەبی ≋ بیدمشک

**شاپ / şap**/: ناو. ١. ڕنوو؛ ڕنی؛ کلێلە؛ کلیلە؛ کەوی ٢. زلله؛ زلە ٣. شەق بە پشتەپێ ٤. شۆپ؛ جێ پا ٥. زاب؛ سواڵەت یان بەردی خڕی چکۆلە ≋ ١. بهمن ٢. سیلی ٣. تیپا؛ اُردنگی ۴. رد؛ جای پا ۵. سنگ یا سُفال گرد و کوچک

**شاپاقاه / şapaqah**/: ناو. شاتەڕە؛ شیرینشاتەڕە ≋ شاهترە

**شاپاڵۆخ / şapałox**/: ناو. شاپالۆغ؛ وەروەرە؛ بەفرەلوو؛ بەفرەلۆ؛ پاڕۆی بەفرماڵ ≋ داموز؛ پاروی برفروبی

**شاپاڵۆغ** / şapałoğ/: ☜ **شاپاڵۆخ**

**شاپان** / şapan/: ناو. داردەستی ئەستوور و حولی ف چُماق صاف و کُلُفت

**شاپانکاری** / şapankarî/: ناو. *[پلار]* ١. کاری تێهەڵدان؛ بەر شەق دان؛ بە شەق لێدان ٢. کاری بە زللە لێدان ف ١. تیپاکاری ٢. عمل زیر سیلی گرفتن

**شاپرز** / şapirz/: ☜ **شپرزە ـ٢**

**شاپرزا** / şapirza/: ☜ **شپرزە ـ٢**

**شاپرزە** / şapirze/: ☜ **شپرزە ـ٢**

**شاپک** / şapik/: ناو. پاتۆل؛ ڕانک ف شلوار

**شاپلیتە** / şap(i)lîte/: ناو. چلۆسک؛ چۆڵەچرا؛ پەڕۆی لە دار بەستراوی چەورکراوی ئاگرتێبەرداو ف مشعل

**شاپوراخ** / şapuřax/: ناو. جۆرێ پەپوولەی زلی خاڵ‌ـخاڵ ف نوعی پروانەی دُرُشت

**شاپۆ** / şapo/: ناو. شەپکە ف شاپو

**شاپو** / şapû/: ☜ **شابو**

**شاپە** / şape/: ناو. ١. ڕنوو؛ هەرەس؛ شاپ کەویەبەفر ٢. تاوێرە بەرد؛ کەڤری مەزن کە لە چیا گلار بێتەوە ٣. خۆیان؛ کلۆشی بە سەریەکا دراو ف ١. بهمن ٢. سنگ بُزرگ غلتان از کوه ٣. تودەی ساقەهای غلە

**شاپەری** / şaperî/: ناو. پەری هەرە جوان ف شاەپری

**شاپەریک** / şaperîk/: ناو. پەپوولە؛ پەڕپەڕۆک؛ باڵفڕنەک ف پروانە

**شاپەڕ** / şapeř/: ناو. شاباڵی مەل ف شهپر

**شاپەسند** / şapesind/: ☜ **شاپەسەند**

**شاپەسەن** / şapesen/: ☜ **شاپەسەند**

**شاپەسەند** / şapesend/: ناو. شاپەسند؛ شاپەسەن؛ مینا: ١. گیادەریمان؛ گیایەکی ئالفی یەک‌ساڵەی ڕازێنەرە لە تیرەی شاپەسەنان، بە گەڵای برگەیی هەمبەر یان کۆز، گوڵی ڕەنگامەی ورد و نارێک و هێشوویی و بەری وشک و دانە ـ دانەی زۆرەوە، بۆ دەرمانی ڕشانەوە و ئاڵووی ناو دەم بەکار دێ ٢. تەوقەگوڵ؛ تۆقەگوڵ؛ گوڵی ئەو گیایە ف ١. گیاه شاەپسند ٢. گُل شاەپسند

**شاپەگیر** / şapegîr/: ناو. هەرەسگر؛ میچێکی لێژ بۆ پاراستنی جادە لە هەرەس ف بهمن‌گیر

**شاپەڵۆخ** / şapełox/: ☜ **شەپلتە**

**شاپینۆز** / şapînoz/: ناو. پینەی هاوڕەنگی پینەکراو ف پینەی همرنگ لباس

**شاپێل** / şapêl/: ناو. پێلی گەورە ف موج بزرگ

**شات**[١] / şat/: ناو. ١. چرۆ؛ لکەداری تازەی یەکساڵان ٢. کاری خۆ هەڵکێشان ٣. زیڕە؛ هەرا ٤. دیلدیلە؛ جۆرێک لەیستۆکە بریتی لە دارێک دەستەیەکی پێوە دەکوتن، منداڵ لێی دەخوڕن ف ١. جوانەی یکسالە ٢. لاف ٣. جیغ ٤. نوعی اسباب‌بازی

◘ **شات بەستن:** هەڵخولان و ڕۆشتنی شتی پان و خڕ ‹پیالەکەم لە دەست داکەوت، شاتی بەست و تا خوار ڕۆیشت!› ف چرخیدن و غلت خوردن چیز گرد

**شات**[٢]: ناوەڵناو. گۆج؛ کوج؛ ئیفلیج ف فلج

**شات**[٣]: پێرۆ. ← **شات‌وشوت**

**شاتا** / şata/: ناو. ئیشتیا؛ وازی خواردن ‹شاتای هیچ شتێکم نییە› ف اشتها؛ میل

**شاتار** / şatar/: ناو. *[مووسیقا]* چەنگ؛ ئامرازێکی موسیقایە، حەوت سیمی هەیە و بە قامک دەژەنرێ ف چنگ

**شاتاڵ** / şatał/: ناو. ١. *[پلار]* خرتکەوپرتکەی ناوماڵ ٢. *[پلار]* جلکی دڕاو ‹شڕ و شاتاڵ› ٣. ☜ **شاتاوڵ ـ١** ف ١. خرت و پرت و اثاثیە ٢. لباس مُندرس ٣. ☜ **شاتاوڵ ـ١**

**شاتاڵ‌وشڕە** / şatał û ş(i)ře/: ناو. *[پلار]* شڕوشاتاڵ

‹باز لە پشیلە و لە تووتی فرە/ ڕژایە سەر یەک شاتاڵوشرە «هەژار، *بۆ کوردستان*»› 🇮🇷 خرت‌وپرت

**شاتان**[1] / şatan/: ☜ **شاتاندن**

**شاتان**[2]: ناو. ١. زیقە؛ زیرە؛ شات ٢. سپیدار؛ سپیندار 🇮🇷 ١. جیغ ٢. سپیدار

**شاتاندن** / şatandin/: چاوگ. *[پەلار]* ١. شاتان؛ زیقاندن؛ زیراندن ٢. شل ڕیان 🇮🇷 ١. جیغ کشیدن ٢. اسهالی ریدن

**شاتانەسەرە** / şatanesere/: ناو. گیایەکە وەک بڕکەی شووتی وایە، بەرەکەی بە قەد هێلکەیەک دەبێ، ناوەکەی سوور و زۆر تاڵە 🇮🇷 گیاهی است

**شاتاوڵ** / şatawił/: ناو. *[پەلار]* ١. شاتاڵ؛ هاشاوڵ؛ پەلامار ٢. کاری تێڕاخوڕین ٣. کاری زیپک تێ‌گرتن 🇮🇷 ١. حمله ٢. نهیب ٣. متلک

**شاتر** / şatir/: ناو. ١. پیادەی زۆر بەپێ ٢. کەسێ کە ئەنگوتک بە تەنوورەوە دەدا ٣. نامەبەر؛ پەیک 🇮🇷 ١. پیادەی بادپا ٢. شاطر ٣. پیک

**شاترنج** / şatrinc/: ناو. ١. گیایەکە ٢. شەترەنج 🇮🇷 ١. گیاهی است ٢. شطرنج

**شاتشاتێن** / şatşatên/: ناو. گەمەی بە شات 🇮🇷 چرخ‌بازی

**شاتک** / şatik/: ☜ **شارەگ**

**شاتلۆرە** / şatillore/: ناو. دۆخی لە سەر تەنشت گلار بوونەوە 🇮🇷 حالت به پهلو غلتیدن

**شاتڵ** / şatił/: ناو. گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ 🇮🇷 گیاه روشنک

**شاتمان** / şatman/: ناو. ناوی جۆرە تفەنگێکە کاری وەستای گوندی «شاتمان»ە! 🇮🇷 نوعی تفنگ دست‌ساز

**شاتنای** / şatnay/: ☜ **شاتاندن**

**شاتورنج** / şaturinc/: ☜ **شەترەنج**

**شاتوشوت** / şat û şût/: ناو. ١. کاری زۆر گوتنی بێ‌کەلک ‹چەند شات‌وشووت، گفتی چرووک، قاقای بلحانە، قسەی سووک! «هەژار، *چوار نامیلکە*»› ٢. کاری بڵاو کردنەوەی درۆی زل ‹گوێ لەم شات‌وشووتانە مەگرە› 🇮🇷 ١. چانەزنی بیهودە ٢. تبلیغات دروغین

**شاتوشووتکەر** / şat û şûtker/: ناوەڵناو. ١. خۆهەڵکێش؛ بافیشکەر؛ چاپچی ٢. بڵاوکەرەوە و پەرە پێدەری دەنگۆ و درۆ 🇮🇷 ١. لافزن ٢. شایعه‌پراکن

**شاتوون** / şaton/: ناو. ١. داری پەڵک ٢. دەستەی پیستوون کە لەگەڵ بان و خوارکردنی پیستووندا دەجووڵێ و میل لەنگ لە نێو موتوردا هەڵدەسووڕێنێ 🇮🇷 ١. درخت غرب ٢. شاتُن

**شاتو** / şatû/: ناو. سوورەتوو؛ تووەسوورە؛ گاتوو 🇮🇷 شاه‌توت

**شاتە** / şate/: ناو. ١. کاری بە درۆ بە خۆدا هەڵدان ٢. نان شاتە؛ نانی تەندوور 🇮🇷 ١. لافزنی ٢. نوعی نان لواش

**شاتەتیری** / şatetîrî/: ناو. نان تیری؛ لەواش 🇮🇷 نوعی لواش

**شاتەڕە** / şateře/: ناو. شەتەڕە؛ شیرین‌شاتەڕە؛ خوێن‌پاڵێن؛ چارەچەقیلە؛ چارانەچەقیلە؛ لیرا؛ شاپاقاه؛ گیایەکی ئالیکی یەک ساڵانە بە گوڵی هێشوویی سوور یان ئەرخەوانییەوە 🇮🇷 شاه‌تره

**شاتەشات** / sateşat/: ناو. زەنا ـ زەنا؛ هەراوهووریا 🇮🇷 جار و جنجال

**شاتەلی** / şatelî/: ناو. نانەقەیسی؛ نان‌قەیسی؛ زەردالوو یان هەنجیری پانەوەکراوی تەنک 🇮🇷 لواشک

**شاتیای** / şatyay/: چاوگ. زیران 🇮🇷 جیغ کشیدن

**شاتیر** / şatîr/: ناو. کاریتە؛ داری گەورەی سەر خانوو 🇮🇷 بالار

**شاتیمان** / şatîman/: ناو. *[ئیلام]* شادومانە؛ شایەتیمان؛ شادمانە؛ شادە؛ شادەوئیمان؛

شادەیمان؛ شادەئیمان؛ ئیمان‌وشادەت؛ شادەت و ئیمان؛ کاری گەوا دان لە سەر تاک و تەنیا بوونی خودا و پەیامهێنەر بوونی موحەمەد، بە وتنـەوەی ئـەم ڕسـتانە: «أشـهد أنْ لا إلـه إلا الله، أشـهد أنّ محمداً رسول الله» ☰ شهادتین

▣ **شـاتیمان هـاوردن/ هێنـان:** شـادە هێنـان: ۱. *[ئیـلام]* گـوتنی شـاتیمان ۲. *[مـەجاز]* ئامـادەی مردن بـوون ☰ ۱. شـهادتین بـر زبـان آوردن ۲. دست از جان شُستن

**شاجوان / şac(i)wan/:** ناوەڵناو. تازەلاوی خوشیک ☰ نوجوان خوش‌تیپ

**شاجۆگە / şacoge/:** ناو. جۆگەی گەورە کـە چـەن جۆگەی بچووکی لێ بێتەوە ☰ جوی بزرگ

**شاجوڕ / şacûř/:** ناو. ساجوڕ؛ کالان ☰ قلادە

**شاچاغ / şaçağ/:** نـاو. گوڵینگە و لەرزانەی سەر، بۆ جوانی و ڕازانەوە ☰ از زیورآلات سر

**شاخ / şax/:** ناو. ۱. سـترۆ؛ سـتروو؛ سـتڕ؛ سـتڕە؛ سترە؛ ئەسرۆ؛ سرۆ؛ ئسترۆ؛ ڕەه؛ شـۆق؛ شـۆتە؛ قۆچ؛ کلۆچ؛ قۆلۆچ؛ قۆخ؛ هیچک؛ زیـادە ئێسـکی ناو هلۆڵ کە بە جووت لە سەر برێ گیانەوەرانـدا دەڕوێـت ‹شـاخی گـا› ۲. کێـو؛ چیـا ۳. چیـای بەردین ٤. لق؛ لکی دار ٥. جێ‌باڕووتی ڕاوکەر ٦. زیقە و زیڕەی بە تـووڕەیی ۷. ڕووش؛ ڕووشـە ☰ ۱. شاخ حیـوان ۲. کـوە ۳. کـوە سـنگی ۴. شـاخە ۵. باروت‌دان شکارچی ۶. جیغ و فریـاد از سـرِ خشـم ۷. خراش

▣ **شاخ‌بەشاخ بوون:** ۱. لێـک گـیرانی شـاخی دوو حەیوانی خاوەن شاخ ۲. *[کینایە]* لە ڕووبەڕووەوە پێکدا دان ‹ماشـینەکان شـاخ‌بەشـاخ بـوون› ۳. *[کینایە]* تێک‌گیران؛ شەڕ کردن ‹ئەو دوو پشـیلە ڕۆژێ چـەن جـار شـاخ‌بەشـاخ دەبـن› ☰ ۱تـا۳. شاخ‌بەشاخ شدن

**شاخ دەرهێنـان:** *[مەجاز]* ۱. یەکجار سەر سووڕمان ‹لەو قسە شـاخم دەرهێنـا› ۲. ئابـڕوو نـەمان و خەجاڵەت بـوون ☰ ۱. بسـیار تعجـب کـردن ۲. رسوا شدن

**شـاخ ڤـەدان:** پـــەرتاوتن؛ کەزاخـــە دان؛ هەڵپەرتاوتن ☰ هرس کردن (درخت)

**شـاخ کـردن:** ۱. ڕووشـــاندن؛ ڕووکانـــدن ۲. چەپۆکانـە کـردنی ئەسـپ ☰ ۱. خراشـیدن ۲. چراغپا کردن اسب

**شاخ لێدان:** ☜ شاخ وەشاندن

**شاخ و باڵ پێ دان:** *[مەجاز]* ۱. گەورە و گرینـگ نیشـان دان ‹هێنـدەیان شـاخ و بـاڵ پـێ دابـوو، هیچـیش نـەبوو!› ۲. دانـە دەم؛ زۆر لـە سـەر چوون و زیـادە ڕاڤـە کـردن ‹وتارەکـەی تـەواو نەدەکرد، هەر شاخ و باڵی پێ دەدا› ☰ ۱. بزرگ و مهم جلوه دادن ۲. کش دادن

**شاخ و باڵ نەبوون:** *[کینایە]* ئاسایی بوون ‹ماڵ خۆ شاخ و باڵی نییە› ☰ شاخ و دُم نداشتن

**شاخ وەشاندن:** شاخ لێدان: ۱. بە شاخ لە کەس یـــان شـــتێک دان ۲. *[مـەجاز]* دڕ بـــوون؛ جەنگەرانی بـوون ☰ ۱. شـاخ زدن ۲. پرخاشـگر بودن

**شاخان / şaxan/:** چاوگ. *[پلار]* گوڕە کردن؛ زیڕانی بە قەڵسی و تووڕەیی ☰ جیغ زدن از سرِ خشم

**شاخاندن / şaxandin/:** چـاوگ. *[پـلار]* شـاخان؛ زیقاندن و هەرا کـردنی بـە تـووڕەیی ☰ بانـگ و فریاد زدن از خشم

**شاخانن / şaxanin/:** ☜ شاخاندن

**شـاخانە / şaxane/:** نـاو. پووشـــانە؛ ئاڵـــفانە ☰ حق‌المرتع

**شاخاو / şaxaw/:** ناوەڵناو. ڕووشـاو؛ ڕووکیـاگ ☰ خراشیدە

**شاخاوی / şaxawî/:** ناوەڵناو. کوێستانی؛ کێفسـانی ☰ کوهستانی

**شاخبزی** / şaxb(i)zî/: ☜ **شاخبێزی**

**شاخبێزی** / şaxbêzî/: ناو. شاخبزی؛ مەرمەڕشا؛ مەرمەڕش؛ مۆری؛ هومایی؛ هومایل؛ سەلمەل؛ پارچەیەکی سپی، ناسک و سفتچنە ▬ چلوار

**شاخپەڕیو** / şaxpeřîw/: ئاوەڵناو. کۆڵە؛ بێشاخ ▬ شاخشکستە

**شاختێز** / şaxtêz/: ناو. شاختێزک؛ شاخ؛ باروتدانی ڕاوچی ▬ جای باروت شکارچی

**شاختێزک** / şaxtêzik/: ☜ **شاختێز**

**شاخدار**[١] / şaxdar/: ناو. ١. *[کینایە، پلار]* دەویت؛ بێناموس ٢. جۆرێ بەری دارمازوو ▬ ١. قُرمساق ٢. نوعی ثمر مازوج

**شاخدار**[٢]: ئاوەڵناو. ١. قۆچدار؛ سترۆدار ٢. *[مەجاز]* زۆر سەیر ‹درۆی شاخدار› ▬ ١و٢. شاخدار

**شاخسپی** / şaxs(i)pî/: ناو. جۆرێ ترێ ▬ نوعی انگور

**شاخستان**[١] / şaxistan/: ناو. کوێستانی بەردین ▬ منطقەی کوهستانی

**شاخستان**[٢]: ئاوەڵناو. شاخاوی ▬ کوهستانی

**شاخشکاو** / şaxş(i)kaw/: ئاوەڵناو. کەتە؛ کەچە ▬ شاخشکستە

**شاخوبەڵەک** / şax û bełek/: ناو. ناز و نووز ▬ ناز و غمزە

**شاخوچڕ** / şax û çiř/: ناو. کوێستان و هەردی پڕ لە دەوەن و گژ و گیا ▬ کوە و درّەی دارای پوشش گیاهی انبوە

**شاخوداخ** / şax û dax/: ناو. کەژ و کێو؛ چڕ و کێو ‹لای وا بوو ئەم هەموو جەنگەڵ و شاخ و داخە باخچەی منە! «هەژار، چێشتی مجێور»› ▬ کوە و کمر

**شاخوەشێن** / şaxweşên/: ئاوەڵناو. جووتقۆشە؛ جفتقۆشە ▬ شاخزن

**شاخوڕ** / şaxuř/: ناو. گردی بەردی؛ تەپۆلکەی بەردین ▬ تپەی سنگی

**شاخە**[١] / şaxe/: ناو. لق؛ بەشێک لە کۆتە و لاسکی دار، دەوەن یان پنجکەگیا کە وەک ساقەتەیەکی بچووکتر لێیەوە سەری هەڵداوە ▬ شاخە

**شاخە**[٢]: دەنگەناو. ١. شریخە؛ دەنگی شکانی شتی ڕەق (وەک: دار) ٢. دەنگی بەقەوەت ‹وەهارەن، سەوزەن، ئاوەن، سەرکاوەن/ هاژەی وەفراوەن، شاخەی شەتاوەن «مەولەوی»› ٣. گوڕە و هەرا ▬ ١. صدای شکستن جسم سخت ٢. صدای رعدآسا ٣. داد و فریاد

⊡ **شاخە هاتن**: ١. گرماندنی هەور ٢. *[مەجاز]* زۆر سارد بوون ‹ئاوی کانییە چاوڕەش شاخەی دێ› ▬ ١. رعد کردن آسمان ٢. بسیار سرد بودن

**شاخەشینکە** / şaxeşînke/: ناو. شتران؛ تەنکە بەردی کەوەڕەنگی زۆر ناسک کە بە دەست هەڵدەوەرێ ▬ نوعی سنگ تُرد

**شاخەنەوات** / şaxenewat/: ناو. نەواتێ کە وەک لقی دار دروست کراوە ▬ شاخەنبات

**شاخەوان** / şaxewan/: ناو. ١. ڕازەوان؛ کەسێ کە بە شاخاندا سەردەکەوێ ٢. کەژەوان؛ کەژوان. هەروەها: **شاخەوانی** ▬ ١. صخرەنورد ٢. کوهنورد

**شاخەوشاخ** / şaxewşax/: ↓

⊡ **شاخەوشاخ بون(ەوە)**: ١. *[کینایە]* شەڕ کردن؛ لێک هەڵشاخان؛ تێک گیران ‹دوێنێ زاواکان شاخەوشاخ بوونەوە› ٢. وێک کەوتن؛ گەپچان؛ لێکدانی ڕووبەڕووی دوو کەرەسەی گواستنەوە ‹لەگەڵ کامیونێکدا شاخەوشاخ بوون› ▬ ١و٢. شاخ بە شاخ شدن

**شاخەوشاخ کردن**: *[کینایە]* بانەوبان کردن؛ لە کارێکدا سەقامگیر نەبوون ‹خەریکی کارێک بە! هێندە شاخەوشاخ مەکە!› ▬ از این شاخ بە آن شاخ پریدن

**شاخی** / şaxî/: ئاوەڵناو. کێوی؛ کێفی ▬ کوهی

**شاخین / şaxîn/**: ئاوەڵناو. لە جنسی شاخ ⚑ شاخی

**شاد / şad/**: ئاوەڵناو. شا؛ دڵخۆش؛ بەکەیف؛ دەماخچاخ ⚑ شاد

⊡ **شاد بوون**: شا بوون؛ دڵخۆش بوون؛ کەیفساز بوون ⚑ شاد بودن

**شاد بونەوە**: شا بوونەوە؛ دڵخۆش بوون.

هەروەها: **شاد کردنەوە** ⚑ شاد شدن

**شادان[1] / şadan/**: ☚ **شادانە**

**شادان[2]**: ئاوەڵناو. بەکەیف؛ کەیفخۆش ‹شیرین! بەهارە، بەهاری شادان/ بێبەهرە لە ژین، گەل نامرادان «ئیبراهیم ئەحمەد»› ⚑ شادان

**شادان[3]**: ئاوەڵکار. بە شادییەوە ‹خەمین چوو، شادان هاتەوە› ⚑ شادان

**شادانە / şadane/**: ناو. شاینە؛ شەدانک؛ شەدانە؛ شادان؛ شاگانە: ١. گیا کەندەر؛ گیایەکی ئاڵفی لە تیرەی شادانان بە گەڵای پەنجەیی ئاویتەی بۆنتیژ، گوڵی نێر و مێ و گوڵڕازێنی هێشوویی و بەری فنۆقی و ناوکەیەکی بێئالبومینەوە ٢. بەری ئەو گیایە ⚑ ١. گیاه شاهدانه ٢. ثمر شاهدانه

**شادمان / şad(i)man/**: ئاوەڵناو. شا؛ شاد؛ شادومان؛ دڵخۆش ⚑ شادمان

**شادمانە / şad(i)mane/**: ☚ **شاتیمان**

**شادمانی / şad(i)manî/**: ناو. ١. دڵخۆشی ٢. گۆڤەند؛ زەماوەند ⚑ ١. شادمانی ٢. عروسی

**شادوشوکور / şad û şukur/**: ئاوەڵناو. دڵخۆشی گەیشتنەوە بە دۆست، لە پاش دووری ⚑ شاد از دیدار دوست پس از هجران

**شادومان / şaduman/**: ☚ **شادمان**

**شادومانە / şadumane/**: ☚ **شاتیمان**

**شادومانی / şadumanî/**: ☚ **شادی ـ٢**

**شادە / şade/**: ناو. ١. کەسێ کە ئاگای لە ڕووداوێکە ٢. شایەتی؛ شەهادە؛ گوزارشی نووسراو یان زارەکی لە ڕووداوێک ٣. ☚ **شاتیمان** ٤. قامکی دۆشاومژە ٥. بەرناترە؛ داری سنووری کا و گەنم ⚑ ١. گواه ٢. گواهی ٣. ☚ **شاتیمان** ۴. انگشت سبابه ۵. چوب فاصل کاه و گندم در خرمن

⊡ **شادە دان**: شایەتی دان لە ڕووداوێ ⚑ گواهی دادن

**شادە هێنان**: ☚ **شاتیمان هاوردن/ هێنان**

**شادەئیمان / şade'îman/**: ☚ **شاتیمان**

**شادەمار / şademar/**: ☚ **شاڕەگ**

**شادەمەرگ / şademerg/**: ناو. سەکتە لە خۆشیان ⚑ سکته از فرط شادی

⊡ **شادەمەرگ بوون**: سەکتە کردن لە بەر دڵخۆشی زۆر ⚑ سکته کردن از فرط شادی

**شادەنوێژ / şaden(i)wêj/**: ناو. تبلی شادە ⚑ انگشت سبابه

**شادە و ئیمان / şade w 'îman/**: ☚ **شاتیمان**

**شادەیمان / şadeyman/**: ☚ **شاتیمان**

**شادی / şadî/**: ناو. ١. کەیفخۆشی ٢. شادومانی؛ داوەتوبزم ٣. عەنتەر؛ جۆرێ مەیموونی چکۆلە ⚑ ١. شادی ٢. جشن و سرور ٣. عنتر

**شادیانە / şad(i)yane/**: ناو. شایانە: ١. زەماوەند؛ گۆڤەند ٢. مزگێنی بۆ خەبەری خۆش ⚑ ١. بزم و جشن عروسی ٢. مُژدگانی

**شادیبەخش / şadîbexş/**: ئاوەڵناو. خەمڕەوێن؛ دڵخۆشکەر ⚑ شادیبخش

**شادیک / şadîk/**: ناو. وەروێرکە؛ وەڕێرک؛ دڵخۆشکەرەی خێزان ‹شادیکا مالێ› ⚑ کودک مایەی دلخوشی خانواده

**شادیهێن / şadîhên/**: ئاوەڵناو. دلڤەکەر؛ دلگوشا ⚑ شادیآور؛ شادیبخش

**شار / şar/**: ناو. ١. باژێر؛ بازێر؛ شەهر؛ بازار؛ شارسان؛ شارستان؛ شارستێن؛ کۆمەڵگای گەورەی مرۆ، بە خانووبەرە و دانیشتوانی زۆرتر لە

۵۰۰۰ کەسەوە کە ژیانیان بە کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بەڕێوە ناچێ ۲. ئەوسەری مەیدانی کایە ۳. کۆمەڵگای گەورەی مێروولە و زەرگەتە و... ٤. داخی؛ گەرمی ٥. سەرپۆشی ژنانە ٦. دەسرۆکەی دەوری کڵاوی لباد ☰ ۱. شهر ۲. آن سوی میدان بازی ۳. لانەی مورچە و زنبور و ... ۴. داغی ۵. سرپوش زنانە ۶. دستمال دور کلاه نمدین

▣ **شاری ئاواتان**: شاری پاکژ؛ کەسنەزاناوا؛ شارێکی خەیاڵی، خاوەن ئازادی و قانوون و حوکمەت و کۆماری دڵخواز ☰ آرمانشهر

**شاری خامۆشان**: /کینایە/ قەورسان؛ زیارەتان؛ شوێنی ناشتنی مردوان ‹بە دل گەر چاوێ بخشێنی لە مەڵبەندی کفنپۆشان/ سەری دل سوور دەمێنێ هێندە سەیرە شاری خامۆشان «هەژار، *شەرەفنامە*»› ☰ گورستان

**شاری کاکی بە کاکی**: شاری هەرکی ـــ هەرکی؛ شاری بێقانوون و بێسەرەوبەرە ☰ شهرِ هِرت

**شاری کایە**: ☜ **شارەکایە**

**شاری هەرکی . هەرکی**: ☜ **شاری کاکی بە کاکی**

**شاری یاری**: ☜ **شارەکایە**

**شارا** / şara/: ناو. شارە؛ شیارە: ۱. ماسوولکەی گەنم لە سەر خەرمان ۲. کەمێ لە خۆیان کە لە درێژەوەیە ۳. کای نێوان دیوارەی چاڵ و دەخڵ ٤. گیشەی دەخڵی درواو ☰ ۱. باریکەی هنوز خرمن نشدەی گندم ۲. ساقەهای در یک خط برهم ریختەی غلە ۳. کاه تیغە میان غلە و خاک در چالە ۴. تودەی درویدەی غلە

**شاران**[1] / şaran/: چاوگ. شاریان؛ شاریانەوە ☰ پنهان شدن

**شاران**[2]: ناو. گەردانەی لە گوێز و بادام ☰ گردنبند از بادام و گردو

**شاراندن** / şarandin/: چاوگ. گەرم کردن ئەوەندەی سوور بێتەوە ☰ تفت دادن

**شارانگەڕ** / şarangeř/: ناو. شارانگەشت؛ گەڕیدە بە باژێراندا ☰ جهانگرد

**شارانگەشت** / şarangeşt/: ☜ **شارانگەڕ**

**شارانەوە** / şaranewe/: ☜ **شاردرانەوە**

**شاراوە** / şarawe/: ئاوەڵناو. شاردراوە؛ شاردراوەوە؛ شارراوە؛ شاریاوە؛ شێردراوە؛ شاریاگەوە؛ بەنهێنی و لە شوێنی نهێنی دانان ☰ پنهان‌شده

**شارای** / şaray/: ☜ **شاردنەوە**

**شارایۆ** / şarayo/: چاوگ. شاردنەوە ☰ پنهان کردن

**شاربەدەر** / şarbeder/: ئاوەڵناو. شاروەدەر؛ لە وڵات دەرکراو ☰ تبعید شده

▣ **شاربەدەر کران**: لە وڵات دوور خرانەوە.

هەروەها: **شاربەدەر بوون؛ شاربەدەر کردن** ☰ تبعید شدن

**شاربەگڕ** / şarbegiř/: ☜ **شارگڕ**

**شاربێز** / şarbêz/: ناو. جۆرە پارچەیەکی قەدیمی تایبەت بە کراسی ژنان ☰ نوعی پارچەی قدیمی

**شارترێن** / şartiřên/: ↓

▣ **شارترێن کردن**: لە وڵات دوور خرانەوە ☰ گروهی زیر مشت و لگد گرفتن

**شارتەیەوە** / şarteyewe/: ☜ **شاردنەوە**

**شارتیای** / şart(i)yay/: ☜ **شاردرانەوە**

**شاردار** / şardar/: ☜ **شارەوان ـ۱**

**شاردرانەوە** / şard(i)ranewe/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //شاردرایەوە؛ دەشاردرێیەوە؛ بشاردرێوە// شارانەوە؛ شاریانەوە؛ شارتیای؛ وەشێردران؛ شاریایۆ؛ حەشار دران ☰ پنهان شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: شاردراوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەشاردرانەوە

**شاردراوە** / şard(i)rawe/: ☜ **شاراوە**

**شاردراوەوە** / şard(i)rawewe/: ☜ **شاراوە**

**شاردن** / şardin/: ☜ **شاردنەوە**

**شاردنگە** / şardinge/: ناو. جێگای شاردنەوە ☰

مخفیگاه

**شـــاردنەوە / şard(i)newe/**: چـــاوگ. تێـــەپ. //شـــاردتەوە؛ دەشـــارییەوە؛ بشـــارەوە// شـــاردن؛ شـــارتەیەوە؛ شـــارای؛ شـــارنای؛ حەشـــار دان؛ بـــە نهێنی تاقەت کردن و لە شوێنێکی نهێنی دانـان ☰ پنهان کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەشاردنەوە

**شارراوە / şarrawe/**: ☜ **شاراوە**

**شارژ / şarj/**: ئاوەڵناو. گەش؛ گەشاوە ☰ شارژ

**شارسازی / şarsazî/**: ناو. کار و ڕەوتی شار درووس کردن ☰ شهرسازی

**شارسان / şarsan/**: نـاو. شارســـتان؛ شارســـتێن؛ شارستێنە؛ شار؛ بازێر؛ بەشێک لە پارێزگا، بـرێتی لە یەک یان چەن شـار و شـارۆچکە و گونـد بـە ئاقارییەوە ☰ شهرستان

**شارســانی / şarsanî/**: ئاوەڵـــناو. شارســـــتانی: ١. بازێری؛ پێوەندیدار یان سەر بە شارەوە ٢. شاری؛ دانیشـــتووی شـــار ٣. *[کینایـە]* بەهرەمەنـــد لـــە دەسکەوتگەلی زانست و پیشەسازی پێشـکەوتوو لە کۆمەڵگادا ☰ ١و٢. شهرستانی ٣. مُتمدِّن

**شارستان / şaristan/**: ☜ **شارسان**

**شارستانی / şaristanî/**: ☜ **شارسانی**

**شارستانیەت / şaristan(i)yet/**: ناو. ژیاری؛ بازێری؛ ژیـوەر: ١. شـارەوەری؛ قۆناغێـک لـە گـوورانی کۆمەڵگای دامـەزراو کـە بنکـە و ڕێخـراوەی بـۆ بەڕێوەچوون هەبێ ٢. ژیار؛ ژیـوار؛ بەهرەمەنـدی لـــە دەســـکەوتگەلی زانســـت و پیشەســـازی پێشکەوتوو لە کۆمەڵگادا ٣. ژیـار؛ ژیـوار؛ جـۆری فەرهەنگ، کارامەیی و شێوەی ژیان کە مـرۆ لـە کۆمەڵـگادا فێـری دەبـێ ٤. جـۆری ڕێکخـراوە، دامەزراوە، ژێهاتوویی و دەسکەوتی فەرهەنگی لـە وڵات یان چاخێکی تایبەتدا ☰ ١تا٤. تمدن

**شارستانیەتی / şaristan(i)yetî/**: ناو. شارستانێتی: ١. ژیاری؛ ژیانی شارسـتان ٢. ژیـار؛ ژیـوار ☰ ١. زندگی شهری ٢. تمدن

**شارستانێتی / şaristanêtî/**: ☜ **شارستانیەتی**

**شارستێن / şaristên/**: ☜ **شارسان**

**شارستێنە / şaristêne/**: ☜ **شارسان**

**شارشارکێن / şarşarkên/**: ☜ **شارشارێن**

**شارشـــارێن / şarşarên/**: نـــاو. شارشـــــارکێن؛ شارشێوێن؛ چاوشارەکێ؛ چاوشاریکێ؛ خۆشارکێ؛ قەرێقەرێ؛ قەراقەرا ☰ قایم‌موشک

**شارشێوێن / şarşêwên/**: ☜ **شارشارێن**

**شارگڕ / şargiř/**: ناو. شاربەگڕ؛ وشەیەکە لـە بـازی چاوشارەکێدا ☰ اصطلاحی در بازی قایم‌موشک

**شارگە / şarge/**: ناو. حەشارگە؛ ڕەبـەت؛ سـیپە ☰ کمینگاه شکارچی

**شارلاتان / şarlatan/**: ئاوەڵـناو. شەڕلاتان؛ دەسـبڕ؛ جامباز ☰ کلاهبردار

**شارمازن / şarmazin/**: نـاو. گەورەشـار؛ کەڵەشـار؛ شاری گـەورە کـە چـەن شـار دەگرێتـە خـۆ ☰ کلانشهر

**شارنای / şarnay/**: ☜ **شاردنەوە**

**شارنشین / şarn(i)şîn/**: ئاوەڵناو. شاری؛ دانیشتووی شار ‹مرۆی شارنشین لـە سروشـت بێگانـە دەبـێ›. هەروەها: **شارنشینی** ☰ شهرنشین

**شارنەوە / şarnewe/**: چاوگ. شاردنەوە؛ ڤەسهاندن ☰ پنهان کردن

**شارواڵ / şarwał/**: ناو. ١. ئاواڵ‌کراسی بـە گنجـی ژنانە ٢. پانتۆڵی پیاوانە ☰ ١. شلوار زنانـە ٢. شـلوار مردانه

**شاروەدەر / şarweder/**: ☜ **شاربەدەر**

▣ **شاروەدەر کردن**: لە شار وەدەر نان ☰ تبعید کردن

**شاروەر / şarwer/**: ☜ **شارۆمەند**

**شاروەری / şarwerî/**: نـاو. شەهرڤانی؛ شـەهرواری؛ بازێری؛ ژیانی‌شار ☰ شهرنشینی

**شارۆ / şaro/:** ناو. ١. پاشارۆ؛ پاشەڕۆک؛ پاشەڕن ٢. گیشەگەنم؛ چەند باقەی درواو ٣. خۆیان؛ کاری کۆ کردنەوەی گەنمی درواو لە سەر جێ خەرمان ٤. *[مەجاز]* کاری پێداچوونەوە؛ دیسانەوە بیر لێ‌کردنەوە ☰ ١. پساچین ٢. دستەای گندم درو شدە ٣. جمع‌آوری گندم درو شدە در خرمن ۴. تجدیدنظر

▣ **شارۆ دان:** شارۆ کردن؛ گەڕان بە دوای میوەی بەجێ‌ماو لە قەد دار یان لە ژێر گەڵا و پێژاڵەوە ☰ پساچین کردن

**شارۆ کردن:** ☜ **شارۆ دان**

**شارۆچکە / şaroçke/:** ☜ **شارۆکە**

**شارۆچکەوان / şaroçkewan/:** ناو. شارۆکەوان؛ بەخشدار؛ ناوچەدار؛ دەڤەردار؛ نوێنەر و بەرپرسی دەوڵەت و وەزارەتی ناوخۆ لە شارۆچکەدا ☰ بخشدار

**شارۆخ / şarox/:** ناو. شارۆق؛ چەمیلە؛ تڕۆزی؛ ترێزوو ☰ خیار چنبر

**شارۆق / şaroq/:** ☜ **شارۆخ**

**شارۆکە / şaroke/:** ناو. شارۆچکە؛ شارووکە؛ شارەک؛ قەسەبچە؛ شاری پچووک ‹لە ناو گوندی تربەسپی ـ کە نیمچە شارۆکەیەک بوو- ژوورێکمان لە ماڵە کلدانییەک بەکرێ گرت و حەسیرــ مەسیرمان لێ ڕاخست و دیسان لێک کۆ بووینەوە «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ شهرک

**شارۆکەوان / şarokewan/:** ☜ **شارۆچکەوان**

**شارۆمەند / şaromend/:** ناو. شاروەر؛ کەسێ کە بە خەڵکی شار یان وڵاتێک دێتە ژمار و لە مافی وێدا بەشدارە ☰ شهروند

**شارور / şarûr/:** ناو. شالوول؛ گاوانی؛ سێرووِ؛ ڕەشۆڵە ☰ سار

**شارووکە / şarûke/:** ☜ **شارۆکە**

**شارە / şare/:** ☜ **شارا**

**شارەبان / şareban/:** ☜ **شارەوان ـ٢**

**شارەدار / şaredar/:** ☜ **شارەوان ـ١**

**شارەداری / şaredarî/:** ☜ **شارەوانی ـ١**

**شارەدز / şarediz/:** ناو. دزخانە؛ دزبازار؛ جێگایێ کە دزی زۆر بێ ☰ دُزدبازار

**شارەدێ / şaredê/:** ناو. گوندی زۆر قەوغا ☰ روستای بسیار بزرگ

**شارەزا / şareza/:** ناوەڵناو. شەهرەزا: ١. بەڵەد؛ ڕێگەزان ‹بە تەنیا ئەوە شارەزای کۆسپ و کەندالی ڕێیە «سوارە»› ٢. زانا لە کاروبار. هەروەها: **شارەزایی** ☰ ١. بلد راه ٢. خُبره

**شارەک / şarek/:** ☜ **شارۆکە**

**شارەکایە / şarekaye/:** ناو. شاری کایە؛ شاری یاری؛ شوێنێک بە کەل‌وپەلی پێویست بۆ یاری و ڕابواردن، بەتایبەت بۆ منداڵان ☰ شهربازی

**شارەمرۆچە / şarem(i)roçe/:** ☜ **شارەمێرو**

**شارەمێرو / şaremêrû/:** ناو. شارەمرۆچە؛ شارەمێرووڵە؛ کونی مێرووڵان ☰ لانەی مورچگان

**شارەمێرووڵە / şaremêrûle/:** ☜ **شارەمێرو**

**شارەوان / şarewan/:** ناو. ١. شارەدار؛ شاردار؛ باژێرڤان؛ بەڕێوەبەری مەزرێنگەی شارەوانی ٢. شارەبان؛ دارۆغە ☰ ١. شهردار ٢. پلیس شهری

**شارەوانی / şarewanî/:** ناو. ١. باژێرڤانی؛ شارەداری؛ ڕێکخراوەیێ کە خزمەتەکانی نێو شاری (وەک: درووس‌کردن و پاراستنی شەقام و پارک و پاک و خاوێن کردنەوەی شار و...) لە ئەستۆدایە ٢. ڕێکخراوەیەکی چەکداری بۆ پاراستنی قانوون و هێمنی شاران ٣. بالاترین دامەزراوەی بەڕێوەبردنی کاروباری شار ☰ ١. شهرداری ٢. شهربانی ٣. استانداری

**شارەوەری / şarewerî/:** ناو. شەهرڤانی؛ شارستانییەت ☰ تمدن

**شاری / şarî/:** ناوەڵناو. ١. پێوەندیدار و سەر بە شار

٢. شارنشین 🇮🇷 ١و٢. شهری

**شاریار** / şaryar/: ناو. شالیار؛ شالّیار؛ شا؛ پاوشا؛ پاشا؛ پادشا 🇮🇷 شهریار

**شاریاگەوە** / şaryagewe/: ☜ شاراوە

**شاریان** / şaryan/: چاوگ. ١. ☜ شاران[1] ٢. داخ بوون؛ زۆر گەرم بوون 🇮🇷 ١. ☜ شاران[1] ٢. داغ شدن

**شاریانەوە** / şaryanewe/: ☜ شاردرانەوە

**شاریاوە** / şaryawe/: ☜ شاراوە

**شاریای** / şaryay/: ناوەڵناو. گەرمداهاتوو 🇮🇷 گرم‌شده

**شاریایۆ** / şaryayo/: ☜ شاردرانەوە

**شاریوەر** / şarîwer/: ناو. خەرمانان؛ مشتاخان؛ ئاخر مانگی هاوین 🇮🇷 شهریور

**شاڕوود** / şarûd/: ناو. مەلێکی زەردی ئاماڵ سەوزە 🇮🇷 پرنده‌ای است

**شاڕەگ** / şareg/: ناو. شەڕەگ؛ شادەمار؛ شاڕەه؛ شاتک؛ کەزیگە؛ دەمارەگەورە؛ هەرکام لەو دوو ڕەگە ئەستوورانەی لا ملی مرۆڤ 🇮🇷 شاهرگ

**شاڕەه** / şareh/: ☜ شاڕەگ

**شاڕەهەن** / şarehen/: ناو. ئاوەڕۆی گەورەی ئاوی پیس 🇮🇷 مجرای بزرگ فاضلاب

**شاڕیشە** / şarîşe/: ناو. ڕەگی هەرە ئەستووری دار 🇮🇷 ریشه‌ی اصلی درخت

**شاڕێ** / şarê/: ناو. شاڕێگە؛ جادەڕێ؛ ڕێگەی پان و سەرەکی 🇮🇷 شاهراه

**شاڕێحان** / şarêĥan/: ناو. باڵنگ؛ باروونە؛ بادرەنگ؛ بادرەشکبۆ 🇮🇷 بادرنگ

**شاڕێز** / şarêz/: ناو. نەخۆشی پدوو 🇮🇷 بیماری لثه

**شاڕێگە** / şarêge/: ☜ شاڕێ

**شاز**[1] / şaz/: ناو. جۆرێ قامیشی زراف 🇮🇷 نوعی نی باریک

**شاز**[2]: ناوەڵناو. ١. هەڵکەوتە؛ بەرکەتی ٢. دەگمەن؛ کەم‌وێنە 🇮🇷 ١. نابغه ٢. نادر

**شازادە** / şazade/: ناو. شازدە؛ شاوەرس: ١. بەچکەشا ٢. [کنایە] لاوی ئاکارباشی دلاوەر 🇮🇷 ١. شاهزاده ٢. شازده

**شازبەند** / şazbend/: ناو. چووزەڵە؛ دووزەڵە 🇮🇷 نوعی ساز بادی

**شازدە** / şazde/: ناو. ١. شانزە؛ شانزدە؛ ژمارەی سەرەکی دوای پازدە و پێش حەڤدە ٢. ☜ شازادە 🇮🇷 ١. شانزده ٢. ☜ شازاده

**شازدەمین** / şazdemîn/: ☜ شازدەهەمین

**شازدەهەم** / şazdehem/: ناوەڵناو. شازدەیەم؛ شانزەیەم؛ شانزدەهی؛ شانزەهوم 🇮🇷 شانزدهم

**شازدەهەمین** / şazdehemîn/: ناوەڵناو. شازدەمین؛ شانزدەمین؛ شانزدەهەمین؛ شانزەیەمین؛ شازدەهەم؛ شازدەیەم 🇮🇷 شانزدهم

**شازدەیەم** / şazdeyem/: ☜ شازدەهەم

**شازی** / şazî/: ناو. جۆرێ مەیموون 🇮🇷 نوعی بوزینه

**شاژن** / şajin/: ناو. ١. ژنی شا ٢. پاتشای مێچکە ٣. سەرەژن؛ ژنی لێهاتووی بەمشوور 🇮🇷 ١. شهبانو ٢. ملکه ٣. کدبانوی کدخدامنش

**شاسوار** / şas(i)war/: ناو. ١. سوارچاک؛ شۆڕەسوار؛ سواری بێ‌وێنە ٢. درووبەکی شینە 🇮🇷 ١. شهسوار ٢. خاری است

**شاسە** / şase/: ناو. ١. جەنگەی شەستە بارانی بەهار ٢. ☜ شایستە 🇮🇷 ١. موسم باران‌های بهاری ٢. ☜ شایسته

**شاسەلیم** / şaselîm/: ناو. بی‌بی‌جان‌خانم 🇮🇷 خیمه‌شب بازی

**شاسەیوان** / şaseywan/: ناو. چادری گەورە؛ خێوەتی زل 🇮🇷 خیمه‌ی بزرگ

**شاسی** / şasî/: ناو. چوارچێوەی ژێر ماشین کە هۆدە و بەشەکانی دیکەی لە سەرە 🇮🇷 شاسی

**شاش**[1] / şaş/: ناو. ١. ☜ شاشك ـ١ ٢. ئەسپێی

ئارد و گەنم ٣. میز؛ گمێز 🇮🇷 ١. ☜ شاشك ـ١ ٢. شپشک آرد و غله ٣. شاش

**شاش**[٢]: ئاوەڵناو. ١. هەڵە؛ سەهو ‹خۆ ئەگەر چی باشت نەدی و ڕێگەکەمت بە شاش زانی، ئەوسا گەردنت ئازا بێ، جوێنێک بدە و بە دەردی کوردە گوتەنی: تفی خۆت باوێژە و بڕۆ! «هەژار، بۆ کوردستان»› ٢. هەڵەکار؛ سەهوکار ٣. تێکەڵ و ئاڵۆزاو ٤. خێل؛ خوێل ٥. شل تەندراو ٦. بیربلاو 🇮🇷 ١. اشتباه ٢. اشتباه‌کار ٣. پخش و پریشان ۴. لوچ ۵. شُلبافت (پارچه) ۶. پریشان‌افکار

**ـ شاش**[٢]: پاشەوشە. ١. ئاڵۆز ‹بیرشاش› ٢. بلاو ‹دیان‌شاش› 🇮🇷 ١. آشفته ٢. پراکنده

**شاشان / şaşan/**: ناو. ژنی سەروێن بە سەر 🇮🇷 زن دستار بر سر

**شاشبەن / şaşben/**: ناو. دۆخی میز گیران 🇮🇷 شاش‌بند

**شاشخاپێن / şaşxapên/**: ئاوەڵناو. /پلار/ خەڵک‌خەڵەتێن 🇮🇷 عوام‌فریب

**شاشک / şaşik/**: ناو. ١. شاش؛ مێزەر؛ پێچی سەر ٢. ناوی گەمەیەکە 🇮🇷 ١. عمّامه؛ دستار ٢. از بازی‌های کودکانه

**شاشگەور / şaşgewr/**: ناو. ١. مێزەرسپی ٢. /کنایه/ هەرکام لە پەیڕەوانی مەزەبی دورزی 🇮🇷 ١. عمامه سفید ٢. پیرو مذهب دُرزی

**شاشوبێش / şaş û bêş/**: ئاوەڵناو. شاش‌ووێش: ١. خواروخێچ ٢. ناڕوون و نادیار (بۆ قسە و کار) 🇮🇷 ١. کج و کوله ٢. مُبهم

**شاشوپەڕ / şaş û peř/**: ناو. جلکی زۆر جوان و ڕێک‌وپێک 🇮🇷 لباس شیک و مُرتب

**شاشوواش / şaş û waş/**: ئاوەڵناو. ١. خوار؛ لار؛ نالەبار ‹کورسییەکی شاش‌وواش دانرابوو› ٢. پەرژوبلاو ‹بیرت شاش‌وواشە!› 🇮🇷 ١. کج‌وکوله ٢. آشفته و پریشان

**شاشووێش / şaş û wêş/**: ☜ شاش‌وبێش

**شاشە / şaşe/**: ناو. ١. مونیتور؛ پەڕەی شاندانی تەلەڤیزیون، کەمپیوتەر و... ٢. شاسە؛ جەنگەی بارانی بەهاری ٣. شەستە؛ زەوی خەتدراو بۆ تووتن چاندن 🇮🇷 ١. مانیتور ٢. موسم باران‌های بهاری ٣. زمین شیار شده برای کشت توتون

**شاشەک / şaşek/**: ناو. ١. کوڕکوڕ؛ قەتێ؛ مەلێکی بۆری پنۆک ـ پنۆکی لە کۆتر گچکەترە گۆشتی دەخورێ ٢. ڕوباب؛ ڕوبابە؛ سازێکی کۆنی بە بیچم وەک تارە 🇮🇷 ١. پرنده‌ی سنگخواره ٢. رُباب

**شاشیک / şaşîk/**: ناو. شاشک؛ مێزەر؛ پێچی سەر 🇮🇷 دستار

**شاشیکاری / şaşîkarî/**: ناو. هەڵەکاری 🇮🇷 اشتباهکاری

**شاشین / şaşîn/**: چاوگ. میزتن؛ میز کردن 🇮🇷 شاشیدن

**شاعر / şa'ir/**: ☜ شاعیر

**شاعیر / şa'îr/**: ناو. شاعر؛ هەستیار؛ هۆنەر؛ هەڵبەستوان؛ کەسێ کە شیعر و هەڵبەست دەهۆنێتەوە 🇮🇷 شاعر

**شاعیرانە**[١] **/ şa'îrane/**: ئاوەڵناو. هەستیارانە؛ بە تایبەتمەندی و شێوەی شاعیران ‹قسەی شاعیرانە› 🇮🇷 شاعرانه

**شاعیرانە**[٢]: ئاوەڵکار. بە شێوە و شێوازی شاعیران ‹زۆر شاعیرانە قسەی دەکرد› 🇮🇷 شاعرانه

**شاعیرۆکە / şa'îroke/**: ئاوەڵناو. /پلار/ کۆلکەشاعیر؛ شاعیری ناتەواو 🇮🇷 نیمچه شاعر

**شاعیری / şa'îrî/**: ناو. ١. بار یان چۆنیەتی شاعیر بوون ‹بە شاعیری نان دەردێنی!› ٢. هونەری شیعر گوتن ‹شاعیری هەروا ئاسان نییە!› 🇮🇷 ١و٢. شاعری

**شاغوڵ / şağuł/**: ☜ شاوڵ

**شاغووڵ / şağûł/**: ☜ شاوڵ

**شاغی / şağî/**: ئاوەڵناو. وەحشی؛ دڕندە ☚ وحشی

**شاف / şaf/**: ناو. پووشڵە؛ پووشەڵە؛ دەرمانێکی قووچی بچووک و پتر ڕۆناوی کە لە کۆمی دەنێن و بە تینی لەش دەتوێتەوە و ڕیخۆڵە پا دەکاتەوە یان لە ڕیخۆڵەوە دەگاتە هەموو جەستە ☚ شیاف

▣ **شاف پێهەڵگرتن**: *[کینایە، چەلار]* خاپاندن ☚ فریب دادن

**شاف هەڵگرتن**: خۆ دەرمان کردن بە شاف ☚ شیاف برداشتن

**شافت / şaft/**: ☜ **شەفت**[1]

**شافر / şafir/**: ناو. ١. بیاوانی چۆڵوهۆڵ ٢. دەشتی پان و بەرینی بێداروبار ☚ ١. بیابان؛ برهوت ٢. جُلگەی وسیع بی رُستنی

**شافعی / şaf(i)'î/**: ناو. سوننی پەیڕەوی ئیمامی شافعی ☚ شافعی مذهب

**شافولاف / şaf û laf/**: ناو. شاتوشووت؛ کاری خۆ هەڵکێشان ☚ لافوگزاف

**شاڤ**[1] **/ şav/**: ☜ **شاوە**

**شاڤ**[2]: دەنگەناو. دەنگی کەروێشک ☚ صدای خرگوش

**شاڤا / şava/**: ناو. هەنگاو؛ گاو ☚ گام

**شاڤاشین / şavaşîn/**: **شینەشاهۆ**

**شاڤە / save/**: ☜ **شاوە**

**شاڤەشین / saveşîn/**: **شینەشاهۆ**

**شاڤین / şavîn/**: چاوگ. قیژاندنی کەروێشک ☚ جیغ کشیدن خرگوش

**شاڤێڕ**[1] **/ şavêř/**: ناو. شاوێڕ؛ گیایەکە ☚ گیاهی است

**شاڤێڕ**[2]: ئاوەڵناو. دەبەنگ؛ زەینکوێر؛ سەربەتاڵ ☚ کودن

**شاق**[1] **/ şaq/**: ناو. ١. ماسیگرە؛ مەلێکی سپییە بە کۆمەڵ ڕاوەماسی دەکەن ٢. شاپ؛ کاری لێدان بە پشتی پێ ٣. هەنگاو ٤. زللە؛ شەقەزلە ٥. گۆچانی بازی گۆیێن ☚ ١. مُرغ ماهیخوار ٢. تیپا ٣. گام ٤. سیلی ٥. چوگان

**شاق**[2]: دەنگەناو. قیژەی مریشک ☚ جیغ مُرغ

**شاقاز / şaqaz/**: ناو. خاسەسی ☚ غاز خاکستری

**شاقام / şaqam/**: ☜ **شاقاو**

**شاقانن / şaqanin/**: چاوگ. قدەقد کردن؛ دەنگ هەڵبڕینی مریشک ☚ قُدقُد کردن مُرغ

**شاقاو / şaqaw/**: ناو. شاقام؛ هەنگاوی زل ☚ گام بُلند

**شاقروان / şaqirwan/**: ناو. بۆق؛ بەق ☚ قورباغه

**شاقز**[1] **/ şaqiz/**: ناو. ١. شاکار ٢. *[کینایە]* کچی جوان ☚ ١. شاهکار ٢. دُختر زیبا

**شاقز**[2]: ئاوەڵناو. لەخۆبایی؛ لووتبەرز ☚ مُتکبر

**شاقڵ / şaqił/**: ناو. دامێنە کەوای لاهەڵتلیشاو ☚ دامن چاکدار

**شاقوبانێ / şaqubanê/**: ☜ **شاقۆبانێ**

**شاقوت / şaqut/**: ناو. کاری پەرتاوتنی لکی زل ☚ هرس شاخه‌های ضخیم

**شاقول / şaqul/**: ☜ **شاقۆڵ ـ٣**

**شاقولاپ / şaqulap/**: ناو. قولاپی درشتی ماسی گرتن ☚ قُلاب بزرگ ماهیگیری

**شاقولیاغا / şaqulyağa/**: ناو. هەنجیرخۆرە؛ مەلێکی ڕەشی پچووکە ☚ پرنده‌ای است

**شاقۆبانێ / şaqobanê/**: ناو. شاقوبانێ؛ شاقۆلانێ؛ شاقۆڵ؛ شەقان؛ شەقانێ؛ شەقوبانێ؛ شەقۆبانێ؛ شەقێن؛ شەکێن؛ شەگێن؛ گەمەی گۆ بازی ☚ چوگان‌بازی

**شاقۆلانێ / şaqolanê/**: ☜ **شاقۆبانێ**

**شاقۆڵ / şaqoł/**: ناو. ١. ☜ **شاقۆبانێ** ٢. ☜ **شاوڵ** ٣. شاقول؛ تەڵەکەروێشک ☚ ١. ☜ **شاقۆبانێ** ٢. ☜ **شاوڵ** ٣. تلەی خرگوش

**شاقووڵ / şaqûl/**: ☜ **شاوڵ**

**شاقەباغی / şaqebağî/**: ☜ **کولەکەسەراوی**

**شاقەپاغی / şaqepağî**/: ☜ **کولەکەسەراوی**

**شاقەل / şaqel**/: ناو. ١. بارست؛ قەوارە؛ قـەبارە ٢. شاقڵ؛ چاکی کەوا ☰ ١. حجم ٢. چاک قبا

**شاقەڵدار / şaqeldar**/: ناوەڵناو. *[مەجاز]* زەلامـی ئەستوور ☰ تنومند

**شاک[1] / şak**/: ناو. ١. قاش؛ بڕە؛ کووز؛ پارچەی بڕاو لە میوە ٢. بەرانی دوو ساڵە؛ شەک بـەرانی ☰ ١. قاچ میوە ٢. قوچ دو ساله

**شاک[2]**: دەنگ. مرقـەی نێـری لـە تـێ‌بەردانـدا ☰ صدای شاک هنگام جفتگیری

**شاکار / şakar**/: ناو. کار یان بەرهـەمێکی وێژەیـی یان هونەری یەکجار سـەیر و سـەمەرە و بـەرچاو کـە نیشـانەی ئەوپـەڕی مامۆسـتایی و لێـزانی داهێنەرەکەیە ☰ شاهکار

**شاکاشی / şakaşî**/: ناو. دەفـری گـەورەی گڵـینی ڕەنگ‌کراو ☰ شەکاسه

**شاکاک / şakak**/: نـاو. گەنــدەمووؤ گەنـــەموو؛ کولــکەمووی زەردی لاجـانگی لاو کـە دوایـی دەوەرێ ☰ کُرک رخسار نوجوانان

**شاکچ / şakiç**/: ناو. شازادەی مێ ☰ شاهدُخت

**شاکلیل / şak(i)lîl**/: نـاو. کلیلێ بە ددانـەی زۆرەوە کە کۆمەڵێک قولف دەکاتەوە ☰ شاه‌کلید

**شاکم / şakim**/: ناوەڵکار. ڕەنگە؛ وێدەچێ؛ هاکا ☰ شاید

**شاکوڕ / şakuř**/: نـاو. ١. شـازادە؛ کـوڕی شـا ٢. *[کینایە]* کوڕی چاک و جوان ☰ ١. شاهپور ٢. شازده

**شاکول / şakul**/: نـاو. پـێڵاوی بـن‌چـەرمی سـەر مووین ☰ نوعی کفش

**شاکوڵ / şakul**/: نـاو. شـاپان؛ تـێڵای لـووس و بێ‌گرێ ☰ چوبدستی صاف

**شاکۆن / şakon**/: نـاو. گۆچـــان؛ دارەدەســـتی سەرچەماوە ☰ عصای سرخمیده

**شاکە / şake**/: نـاو. ١. باڵەفڕەی جووچکـەی تـازە فێرە فڕین ٢. کـار و ڕەوتی پاڕانـەوە ☰ ١. عمـل پرپر زدن جوجه‌ی پرنده ٢. لابه

**شاکەزی / şakezî**/: نـاو. شابسـک؛ مـووی درێـژی ناوەڕاست و پێشەوەی سەر ☰ کاکُل

**شاکەشاک / şakeşak**/: ناو. ١. لاڵە و پاڕانەوەی زۆر ٢. هەڵپە و پەلە ☰ ١. لابه و التماس زیاد ٢. عجله

**شاکەڵ / şakel**/: ناوەڵناو. ١. ئاڵی؛ دەستگۆ؛ ژناخـە ٢. سـەرچمک؛ گەشـترین (گیـای بـەهار) ☰ ١. زن‌ذلیل ٢. شاداب‌ترین (سبزه‌ی بهاری)

**شاگا / şaga**/: سازسته. شـاگە؛ وشـەیەکە جیـاتی سڵاو و مەرحەبا ☰ اصطلاحی به جای سلام

**شاگانە / şagane**/: ☜ **شادانه**

**شاگرد / şagird**/: نـاو. ١. قوتـابی؛ کەسـێ کـە خەریکی فێر بوونی زانست یان کارێکە ‹شاگردی فێرگـــە› ٢. بەردەســـت؛ وەردەس؛ وەروێڕکـــە؛ بەرهۆسـتا؛ کرێکـاری نێـو دووکـان، بەتایبـەت کارگەی چکۆلە ‹شاگردی وەستا› ☰ ١و٢. شاگرد

**شاگردانە / şagirdane**/: نـاو. دەسخۆشانە؛ نەودارە؛ هبوودی؛ ئاوەڵانە؛ چێشتانە؛ دیاری یـان پارەیـێ کە وەک دەسخۆشی بە کرێکـاری نێـو دووکـان دەدرێت ☰ شاگردانه

**شاگردە / şagirde**/: نـاو. دارێکـی سـەر بەئاڵـقەیە جۆلا تالی ڕایەڵی پێ دەبژێرێ ☰ شانه‌ی تارشُمار جولایی

**شاگردی / şagirdî**/: نـاو. کـار و ڕەوتی شـاگرد و بەردەست بوون ☰ شاگردی

**شاگوڵبەند / şagulbend**/: نـاو. بـێن‌خۆشـــکە؛ بۆخۆشکە؛ شالان؛ گیایەکی لاسک و گەڵا باریکە، گـــەڵاکانی لـــە گـــەڵای سۆســـن دەچـــێ و گوڵەکانیشی وەک سۆسـنی شـین وان، بـەرزی دەگاتە میتریک ☰ گیاهی است

**شاگوڵ / şagul**/: ناو. ١. گوڵـی گـەورەی وێنـەی سەر مـافوورە ٢. گوڵـی سـەرەکی دەخـڵ ☰ ١.

نقش بزرگ قالی ۲. خوشه‌ی برتر غله

**شاگونج / şagunc/:** ناو. دارێکە وەک ڕەحەتی دەخرێتە دەم دۆلاشەوە ☰ چوب قیف مانند دهانه‌ی ناو آسیاب

**شاگه / şage/:** ☜ **شاگا**

**شاگه‌ردانی / şagerdanî/:** ناو. پاشاگەردانی؛ دنیای بێقانوون و پڕ لە ئاژاوە ☰ اوضاع پُر آشوب

**شاگه‌شکه / sageşke/:** ناو. شانەمەرگ: ۱. ڕەوتی بوورانەوە لە خۆشیان ۲. پووکاولە؛ پووک؛ چەمۆلە ☰ ۱. غش از شادی ۲. عمل پنجه به طرف کسی گرفتن با اهانت

◻ **شاگه‌شکه بون/ لێهاتن:** بوورانەوە لە خۆشیان ☰ غش کردن از شادی

**شاگه‌شکه لێنان:** پووکاولە لێنان؛ چەمۆلە لێنان ☰ ام کردن؛ پنجه گذاشتن

**شال / şal/:** ناو. ۱. شاڵ؛ کووتاڵی لە بەنی خوری بۆ ڕانک و چۆخە ۲. چەتانی کلۆش ڕاگوێزتن بۆ سەر خەرمان ☰ ۱. پارچه‌ی دستباف پشمی ۲. گاری مخصوص انتقال غله‌ی درویده به سر خرمن

**شالانگ / şalang/:** ناو. گولەدیاری؛ گولەئەسپەک؛ گولە خەنجەری؛ گەلایۆل ☰ گلایول

**شالق / şaliq/:** ناو. شالک؛ گەورەترین لقی دار بە لک و پەلی زۆرەوە ☰ بزرگترین شاخه‌ی درخت

**شالک / şalik/:** ناو. ۱. عابا؛ جلی تەنکی فش و فۆڵ ۲. ☜ **شالق** ☰ ۱. عبا ۲. ☜ **شالق**

**شاللور / şallur/:** ☜ **شالور**

**شالو / şalû/:** ناو. کولێرەی بە شەدانەوە ☰ گرده‌ی نان خاشخاشی

**شالوت / şalût/:** ئاوەڵناو. لووت‌زل ☰ دماغ گُنده

**شالور / şalûr/:** ناو. شالوول؛ شاللور؛ شالوویل؛ شالیل؛ شەهلوول؛ سەرکەشکە؛ تۆرەمە باڵندەیەکن بە دەنگی خۆش بەناوبانگن، زیاتر لە شوێنی ڕووتەن دەژین، دوو جۆری پچووک و گەورەیان هەیە ☰ پرنده‌ی چاق‌لق

**شالوز / şalûz/:** ئاوەڵناو. */پەلار/* ڕیاباز؛ مەرایی‌کەر ☰ چاپلوس

**شالوک / şalûk/:** ناو. ڕیشۆڵی ☰ سار

**شالول / şalûl/:** ☜ **شالور**

**شالوله / şalûle/:** ناو. شابۆری؛ لوولەی سەرەکی ئەستوور ☰ شاه‌لوله

**شالویل / şalûyl/:** ☜ **شالور**

**شالیار / şalyar/:** ناو. شالیار: ۱. پاتشای شار ۲. شایار؛ ئاواڵ و دۆستی شا ☰ ۱. شهریار ۲. یارِ شاه

**شالیاری / şal(i)yarî/:** ناو. وەزارەت؛ وەزیری ☰ وزارت

**شالیل / şalîl/:** ☜ **شالور**

**شاڵ / şał/:** ناو. ۱. ☜ **شال -۱** ۲. پارچەی سەوزی تایبەتی پێچ و پشتێنی سەید ۳. بووزوو؛ شاشک؛ جۆرێک قوماشی پەشمی ٤. پشتوێن؛ پشتێند ٥. ☜ **شاڵگەردن** ☰ ۱. ☜ **شال -۱** ۲. پارچه‌ی سبز ویژه‌ی دستار سادات ۳. نوعی پارچه‌ی پشمی ۴. کمربند پارچه‌ای ۵. ☜ **شاڵگەردن**

◻ **شاڵ دان:** شۆردنی کەڵ و گامێش ‹کەڵ و گامێشەکانی لەو چۆمە شاڵ دا› ☰ شُستن گاومیش

**شاڵانوداڵان / şałan û dałan/:** ناو. */فرهنگ مردم/* ناوێکی خەیاڵییە بۆ ترساندنی منداڵ دەیڵێن ‹مەگری! ئەوە شاڵانوداڵان لە حەوشەیە!› ☰ کلمه‌ای برای ترساندن کودک

**شاڵاو / şaław/:** ناو. پەلامار؛ هێرش؛ هەڵمەت ☰ هجوم؛ حمله

◻ **شاڵاو بردن:** ☜ **شاڵاو هێنان**

**شاڵاو دان:** ڕنەک لێدان؛ خوراندنی پشتی ماڵات بە ڕنەک ☰ خاراندن پشت احشام با بُرُس

**شاڵاو هێنان:** شاڵاو بردن؛ پەلامار دان؛ هێرش

هێنان؛ هەڵمەت بردن ☰ هجوم آوردن

**شالاوبەر** / şaławber/: ناو. هەڵمەتدەر ☰ مُهاجم

**شاڵبافی** / şałbafî/: ناو. جۆلایی؛ جوولگی؛ کاری بووزووچن ☰ بافندگی

**شاڵگەردن** / şałgerdin/: ناو. شاڵ؛ شاڵگەردەن؛ ملپێچ؛ تیکە پارچەیەکی پەشمی یان دەسچن بۆ داپۆشانی سەر و مل لە سەرمادا ☰ شال‌گردن

**شاڵگەردەن** / şałgerden/: ☜ **شاڵگەردن**

**شاڵوار** / şałwar/: ☜ **شواڵ**

**شاڵیار** / şałyar/: ☜ **شالیار**

**شاڵیگا** / şałîga/: ناو. برنجار؛ برنجەجار؛ مەرەزە؛ چەڵتووکجار؛ کێڵگەی برنج ☰ شالیزار

**شاڵینە** / şałîne/: ناو. پارچەی چوارگۆشە لە خوری ☰ پارچەی چهارگوش پشمین

**شام** / şam/: ناو. ۱. نانی شێوان ۲. تەنگی نوێژی شێوان ☰ ۱. وعدەی غذایی شام ۲. شامگاه

⊡ **شام خواردن:** شیڤ خارن؛ شیڤ کرن؛ شام کردن؛ شێو خواردن ☰ شام خوردن

**شام کردن:** ☜ **شام خواردن**

**شامات** / şamat/: ناو. ۱. دەشتی شۆرەکات ۲. وشەی دۆڕانی شەترنج ☰ ۱. جُلگەی شورەزار ۲. شەمات شطرنج

**شامار** / şamar/: ناو. حەزیا؛ زەها؛ ئەژدیها ☰ اژدها

**شاماکی** / şamakî/: ناو. بەردلک؛ مەمکبەند ☰ پستان‌بند

**شامبۆز** / şamboz/: ناو،ئاو. ئازا؛ جوامێر ☰ شُجاع

**شامبۆیی** / şamboyî/: ناو. گەماڵی خێرای ئاگاداری ڕان و مێگەل ☰ سگ گله

**شامپانزە** / şampanze/: ناو. جۆرێ مەیموونە کە بە دارەوە دەژی، وەک مرۆ دەنوێنێ و لە هەموو مەیموونیتر زیرەکترە ☰ شامپانزه

**شامپۆ** / şampo/: ناو. تراوی خەستی سەر شتن ☰ شامپو

**شامدەرزی** / şamderzî/: ناو. جۆرێ شمشێری بەناوبانگە ☰ نوعی شمشیر مشهور

**شامۆیی** / şamoyî/: ناو. جۆرێ تووتن ☰ نوعی توتون

**شامەتروکە** / şamet(i)rûke/: ناو. هەنگێکی چکۆلەیە لە کولۆرەی داراندا شانە دەبەستێ ☰ نوعی زنبور عسل

**شامەرگ** / şamerg/: ناو. مەرگی لە بەر خۆشی و شایی ‹لە خۆشیدا خەریک بوو شامەرگ بێ› ☰ مرگ از شادی

**شامەقسود** / şameqsûd/: ناو. بەردێکی کارەبایی گرانبایی کە تەزبێحی لێ ساز دەکەن ☰ شاەمقصود

**شامەلحەم** / sameɫĥem/: ناو. گیایەکە مەلحەمی برینی لێ ساز دەکەن ☰ گیاهی دارویی

**شامی**[1] / şamî/: ناو. ۱. ☜ **شووتی** ۲. گەنمەشامی؛ گوڵەپێغەمبەرە؛ گوڵەگەنم ۳. قەلەموونە؛ بەقلەمووت؛ عەلەشیش ☰ ۱. ☜ **شووتی** ۲. ذُرت ۳. بوقلمون

**شامی**[2]: ناو،ئاو. ۱. دانیشتووی ولاتی شام ۲. سەر بە ولاتی شام ☰ ۱. اهل سوریه ۲. منسوب به سرزمین شام

**شامیچلە** / şamîç(i)le/: ناو. سفرەی چوارشەمەکولە، بریتی لە نۆک، گەنم، گەنمەشامی، کونجی، چەوان، گوڵەبەڕۆژە و شووتی کە تۆنگەیەک ئاوی لە سەرە ☰ سفرەی چهارشنبەسوری

**شامیکەباب** / şamîkebab/: ناو. شانی کەباب؛ شامیکەواو؛ شفتە؛ کفتە؛ کفتەناوتاوەیی؛ جۆرێ خۆراکە لە قیمە و ئاردی نۆکەقەنی کە لە ناو ڕۆندا سوور دەکرێتەوە ☰ کباب شامی

**شامیکەواو** / şamîkewaw/: ☜ **شامیکەباب**

**شامێر** / şamêr/: ☜ **شامێرو**

**شامێرو** / şamêrû/: ناو. شامێر؛ مێروولەی درشت ☰ مورچەی درشت

**شان** / şan/: ناو. ۱. پیل؛ نێوان سەر قۆڵ و مل لە هەر دوو لاوە، بەشی سەرووی لەش کە باڵ بە ناوقەدەوە دەلکێنێ، بریتی لە ئێسکی سەر شان، جومگە و ماسوولکەکانی ۲. شکۆ و گەورەیی ‹شاتیمان بێرە شان پەیغەمەر!› ۳. دەرەجە و پلە ‹بەم قسە شانی پێ دا› ٤. تووتە؛ نیشان؛ نیشانە؛ خاڵی سەر گۆنا ٥. شانە؛ جێگەی گەرا و هەنگوینی مێش ٦. ملەی کێو ۷. نیشان؛ پیشان ☰ ۱. کتف ۲. شأن و شکوە ۳. پایە و درجە ۴. خال گونە ۵. شانەی زنبور عسل ۶. ستیغ کوە ۷. نشان

▣ **شان بۆ کارێک شل کردن**: تەواو خۆ تەرخان کردن بۆ کارێک؛ بە دڵ و گیان بەرەو پیری کارێک چوون ‹شانی بۆ شل کە و دەرسەکانت بخوێنە تا سەر کەوی› ☰ بە یک طرف کج شدن

**شان خستن**: کەوتنە لا؛ بە لایەکدا خوار بوونەوە ‹ماشینەکە لە سەر پێنج شانی خست› ☰ بە یک طرف کج شدن

**شان خەفانن**: داهاتنەوە؛ چەماندنەوەی شان ☰ خم شدن

**شان داچەکان**: لاشان خوار بوون و پێسیر شل و ئاواڵە بوون ☰ شانە کج و یقە نامرتب و باز بودن

**شان داخستن**: /کنایە/ شان داهێشتن؛ شان داهێلان؛ خۆ بە دەستەوە دان ☰ تسلیم شدن

**شان دادان**: لە سەر تەنشت خۆ درێژ کردن ☰ بە پهلو دراز کشیدن

**شان دان**: شانی دان؛ نیشان‌دان؛ ڕانان؛ شتێ هێنانە بەرچاوی کەسێ ☰ نشان دادن

**شان داهێشتن**: ☜ **شان داخستن**

**شان داهێلان**: ☜ **شان داخستن**

**شان لادان**: /کنایە/ نەچوونە ژێر کار ☰ شانە خالی کردن

**شان لە شانی کەسێک/ شتێک دان**: /کنایە/ هاوتەرازی کەسێک بوون ‹کێ هەیە لە ئازایەتیدا شان لە شانی پێشمەرگە بدات؟› ☰ با کسی/ چیزی برابری کردن

**شان لێ شل کردن**: /کنایە/ بە تاقەت و وردبینییەوە دەست بۆ کارێ بردن ☰ با دقت و حوصلە بە کاری پرداختن

**شان وەشاندن**: /کنایە/ هەڕەشە کردن ☰ تهدید کردن

**شان هەڵتەکاندن**: دەربایس نەبوون ☰ شانە بالا انداختن

**کردنە شان**: بە شانەوە هەڵواسین ‹تفەنگەکەی کردە شانی و چوو بۆ ڕاو› ☰ بە شانە آویختن

**شانا** / şana/: ☜ **شانە۱**

**شانازی** / şanazî/: ناو. کار و ڕەوتی نازین؛ سەرفیرازی کردن ‹ئێمە شانازی بە ڕۆڵە زانا و ئازاکانمان دەکەین› ☰ افتخار؛ مُباهات

**شانازیهێن** / şanazîhên/: ئاوەڵناو. هۆی شانازی ☰ مایەی مُباهات

**شانامە** / şaname/: ناو. شاهنامە؛ پەرتووکی بەسەرهاتی پاتشایان ☰ شاهنامە

**شانای** / şanay/: چاوگ. شانتەی: ۱. ناردن ۲. ڕاوەشاندن؛ تەکاندن (دار) ۳. وەشاندن؛ پژاندن ‹ژەرەژ نەوانۆ جە سەر نساران/ شەماڵ نەشانۆ شەونم وە داران «بێسارانی»› ☰ ۱. فرستاندن ۲. تکان دادن (درخت) ۳. افشاندن

**شانبەشان** / şanbeşan/: ئاوەڵکار. پێکەوە؛ پێکڕا؛ پاڵبەپاڵ؛ دووقۆڵی؛ بە یەکەوە ‹تاژدین دەریخا ئەسپ لە خاوا/ سوار بێ و بچێ شانبەشانی زاوا «هەژار، *مەموزین*»› ☰ دوشادوش

**شانپۆش** / şanpoş/: ناو. شتێ کە بە سەر شاندا دەدرێ ☰ کتف‌پوش

**شانتەی** / şantey/: ☜ **شانای**

**شاند / şand/**: ناو. دەستە؛ تاقم؛ گرۆ؛ لێژنە؛ وەفد ☗ گروه؛ هیأت

▣ **شاندی چەكداری**: دەستەی شەڕكەر ☗ گروه نظامی

**شانداچەكاو / şandaçekaw/**: ئاوەڵناو. لاشان خوار ☗ شانه خمیده

**شاندار / şandar/**: ئاوەڵناو. بە شكۆ؛ پایەبەرز ☗ بُلندمرتبه

**شاندن / şandin/**: چاوگ. شانن؛ شیاندن؛ شینای: ١. ناردن؛ ڕەوانە كردن ٢. چاندنی تۆم ٣. بە دەم باوە بزووتن ٤. ڕجوا/ ڕەوا دیتن ☗ ١. فرستادن ٢. بذر پاشیدن ٣. جُنبیدن با باد ۴. روا دیدن

**شاندوخ / şandox/**: ناو. قاسید؛ هەواڵبەر ☗ پیک؛ قاصد

**شاندەر / şander/**: ناو. نیشاندەر ☗ نشان‌دهنده

**شاندەلیك / şandelîk/**: ناو. زەردەواڵە؛ زەرگەتە ☗ زنبور زرد

**شاندی / şandî/**: ئاوەڵناو. ١. ڕەوانەكراو ٢. چاندراو ٣. ڕاژێندراو ☗ ١. فرستاده شده ٢. پاشیده شده ٣. جنبانیده شده

**شاندیار / şandyar/**: ناو. ڕێنوێنی دەستە ☗ راهنمای گروه

**شاندیەك / şandyek/**: ناو. قاسید؛ هەواڵبەر ☗ پیک؛ قاصد

**شانزدە / şanzde/**: ☜ **شازدە ـ١**

**شانزدەمین / şanzdemîn/**: ☜ **شازدەهەمین**

**شانزدەهەمین / şanzdehemîn/**: ☜ **شازدەهەمین**

**شانزدەهی / şanzdehî/**: ☜ **شازدەهەم**

**شانزە / şanze/**: ☜ **شازدە ـ١**

**شانزەهوم / şanzehum/**: ☜ **شازدەهەم**

**شانزیەم / şanzeyem/**: ☜ **شازدەهەم**

**شانزیەمین / şanzeyemîn/**: ☜ **شازدەهەمین**

**شانس / şans/**: ناو. بەخت؛ تاڵە؛ فیشكە؛ ڕەشنە ☗ شانس

▣ **شانس بون**: شانس هەبوون؛ بەخت یار بوون؛ شانس لەگەڵ بوون ☗ شانس داشتن

**شانس هەبون**: ☜ **شانس بون**

**شانس هێنان**: باش هێنان ☗ شانس آوردن

**شانسی / şansî/**: ناو/ ئاوەڵكار. خۆوبەخت؛ خوابەختەكی ☗ شانسی

**شانشین / şan(i)şîn/**: ناو. ١. بەربێلایی نزیك پەنجەرە لە ناو ئۆدەدا بۆ دانیشتنی نەجیمزادان ٢. پاتەختی وڵات ☗ ١. شاەنشین ٢. پایتخت

**شانك / şank/**: ناو. ئازەوی؛ جوانەزمە ☗ جوش جوانی

**شانگ / şang/**: ناو. ستۆ؛ شان ☗ كتف

**شانن / şanin/**: ☜ **شاندن**

**شانوشكۆ / şan û ş(i)ko/**: ناو. پایەبەرزی ☗ شكوهمندی

**شانوشەپیلك / şan û şepîlik/**: ناو. لای سەرووی لەش ☗ بالاتنه

**شانۆ / şano/**: ناو. شانۆك: ١. هونەری ڕانانی چیرۆك و ڕووداوان ٢. سەكۆی كۆسەكاری؛ شوێنی هونەر نواندنی وازیكەران ☗ ١. نمایش ٢. صحنه‌ی نمایش

**شانۆچن / şanoçin/**: ناو. دیكۆراتۆری سەر شانۆ ☗ طراح صحنه

**شانۆچنی / şanoç(i)nî/**: ناو. كار و ڕەوتی ڕازاندنەوەی سەر شانۆ ☗ طراحی صحنه

**شانۆخانە / şanoxane/**: ناو. تماشاخانە؛ یانەی شانۆك؛ تەلاری تەئاتر ☗ تالار نمایش

**شانۆك / şanok/**: ☜ **شانۆ**

**شانۆكار / şanokar/**: ☜ **شانۆگەر**

**شانۆكنوس / şanoknûs/**: ناو. شانۆنامەنووس؛ ئەو كەسەی چیرۆك بۆ شانۆ دەنووسێ ☗ نمایشنامەنویس

**شانۆکەباخی** / şanokebaxî/: ناو. جافری؛ جەعفەری؛ مەعدەنووس 🇮🇷 جعفری

**شانۆکی**[1] / şanokî/: ناو. جافری؛ جەعفەری 🇮🇷 جعفری

**شانۆکی**[2]: ئاوەڵناو. شانۆیی؛ نومایشی 🇮🇷 نمایشی

**شانۆگەر** / şanoger/: ناو. شانۆکار؛ شانۆیار؛ نیار؛ نیارڤان؛ کۆسەکار؛ ئەو کەسەی لە شانۆدا دەور دەگێڕێ 🇮🇷 هُنرپیشەی تأتر

**شانۆگەری** / şanogerî/: ناو. ١. کار و ڕەوتی دەور گێڕان لە شانۆ ٢. شانۆ؛ هونەری ڕانانی چیرۆک و ڕووداوان 🇮🇷 ١. هنرپیشگی ٢. نمایش

**شانۆگێڕ** / şanogêř/: ناو. دەرهێنەر؛ کەسێ کە شانۆ بەڕێوە دەبا 🇮🇷 کارگردان

**شانۆنامە** / şanoname/: ناو. چیرۆکی شانۆ 🇮🇷 نمایشنامە

**شانۆنامەنوس** / şanonamenûs/: ناو. شانۆنووس؛ ئەو کەسە چیرۆک بۆ شانۆ دەنووسێ 🇮🇷 نمایشنامەنویس

**شانۆنوس** / şanonûs/: ☜ **شانونامەنوس**

**شانۆیار** / şanoyar/: ☜ **شانۆگەر**

**شانۆیی** / şanoyî/: ئاوەڵناو. پێوەندیدار و سەر بە شانۆ ‹هونەری شانۆیی› 🇮🇷 نمایشی

**شانە** / şane/: ناو. ١. شانا؛ شانی؛ ئامرازێکی ددانەدار کە سەر و ڕیشی پێ دادێنن ‹ڕیشت دانا شانەی بۆ هەڵگرە «مەسەل»› ٢. کۆمەڵە خانەیەکی هاوشێوە کە پێکەوە فرمانێک جێبەجێ دەکەن ‹شانەی ئێسک› ٣. چەند شیشە ئاسنی سەرتیژی دە دار کوتراو بۆ خوری و موو لێک هەڵوەشاندن ٤. چەوکێش ٥. ☜ **شەحنە** ٦. شانی هەنگوین ٧. سەرکاری گوند ٨. دەفە؛ ئامرازێکی دەزگای جۆلا ٩. کاسێت؛ نەوار ١٠. دەفرێکی چاوە ـ چاوە بۆ هەڵگرتنی شتی ناسک ‹شانەی هێلکە› 🇮🇷 ١. شانەی سر ٢. بافت ٣. شانەی فلزی پشم و مو صاف‌کن ۴. شَن‌کش ۵. ☜ **شەحنە** ۶ شانەی عسل ۷. مُباشر ارباب ۸ ابزاری در کارگاه بافندگی ۹. کاست ۱۰. شانە

◘ **شانە کردن**: داهێنانی موو بە شانە 🇮🇷 شانە کردن

**شانەبەسەر** / şanebeser/: ناو. شانەسەرە؛ پەپووسێمانە 🇮🇷 هُدهُد

**شانەر** / şaner/: ناو. سانەر؛ شێنەر؛ بەڕێکەر 🇮🇷 فرستندە

**شانەڕەقە** / şaneřeqe/: ناو. کۆڵنجی شان و مل 🇮🇷 اسپاسم عضلانی شانە و گردن

**شانەسەرە** / şanesere/: ☜ **شانەبەسەر**

**شانەشاخ** / şaneşax/: ناو. کاوان؛ بستوو 🇮🇷 ستیغ کوە

**شانەک** / şanek/: ناو. شانیک؛ بەڵگە؛ نیشانە؛ دەلیل ‹شانەکت چییە بۆ قسەی وا؟› 🇮🇷 دلیل؛ مدرک

**شانەکار** / şanekar/: ناو. بووک‌جوانکەر 🇮🇷 آرایشگر عروس

**شانەکراو** / şanek(i)raw/: ئاوەڵناو. داهاتوو 🇮🇷 شانەشدە

**شانەکسکێ** / şanekiskê/: ناو. حاڵەتی هەڵکوورمان و خۆ کۆ کردنەوە لە بەر سەرما ‹کلیلی باخی دا دەستم کە چوومە ناو گوڵ و گوڵزار/ لە لەرزە و شانەکسکێی بەفر و سەرمای مانگی دەی کردم «قانع»› 🇮🇷 حالت کز کردگی بر اثر سرما

**شانەکوڕە** / şanekûře/: ناو. داڵ؛ خەرتەڵ؛ داڵەکەرخۆرە؛ کەرخۆر؛ پەلەوەرێک بە باڵی پان و درێژ، کلکی چوارسووچی کورت و ئاماڵڕەشەوە کە دەتوانێ ملی لە نێو شانیدا خڕ کاتەوە 🇮🇷 دال

**شانەکەر** / şaneker/: ناو. ئەوی خوری و کولکە بە شانە دەکا 🇮🇷 شانەزن پشم و مو

**شانەگورگ** / şanegurg/: ناو. گیایەکە لە پەنجە گورگ ئەکا 🇮🇷 گیاهی است

**شانەگەر** / şaneger/: ناو. وەستای شانە دروست کردن 🕮 شانەساز

**شانەمەرگ** / şanemerg/: ☜ **شاگەشکە**

**شانەوشان**[1] / şane w şan/: ناو. ١. درێژایی ملەی کێو؛ یالەویالی کێو ‹بەو شانەوشانەدا بڕۆ ڕێگەیە› ٢. کار و ڕەوتی هەڵگەڕانەوە لە تەنشتێ بۆ سەر تەنشتێ تر 🕮 ١. طول تیغەی کوه ٢. غلت بر پهلو

▣ **شانەوشان کردن:** تل دان؛ هەڵگەڕانەوە/ هەڵگەڕاندنەوە لە تەنشتێ بۆ سەر تەنشتێکی تر ‹با شانەوشانێ کەم، با دەستەملانت کەم «فولکلۆر»› 🕮 غلت زدن/ دادن

**شانەوشان**[2]: ناوەڵکار. ١. هاوشان؛ شانبەشان؛ بە شێوەی لە شانی یەکتردا ‹جادەکەیان شانەوشانی ڕووباری زاب کێشاوە› ٢. بە حاڵەتی شان ڕاژاندن لە ڕۆیشتنا ‹شانەوشان ئەچێ و کەس بە هیچ ناگرێ!› 🕮 ١. بە صورت موازی ٢. با حالت شانەها را حرکت دادن در راه رفتن

**شانەهەنگوین** / şaneheng(i)wîn/: ناو. تیرەشان 🕮 شانەی عسل

**شانی** / şanî/: ناو. ١. ☜ **شانە ـ١** ٢. نیشان؛ بەڵگە 🕮 ١. ☜ **شانە‌ـ١** ٢. دلیل؛ مدرک

▣ **شانی دان:** ☜ **شان دان**

**شانیای** / şanyay/: ☜ **وەشێنران**

**شانیک** / şanîk/: ☜ **شانەك**

**شانیکەباب** / şanîkebab/: ☜ **شامیکەباب**

**شانین** / şanîn/: چاوگ. ١. تووڕ دان ٢. ڕاژاندن 🕮 ١. پرت کردن ٢. جُنباندن

**شاو** / şaw/: ناو. شیوەڵە؛ دۆڵی بووچک 🕮 درّەی کوچک

**شاواز** / şawaz/: ناو. ١. ☜ **شاباش** ٢. ☜ **شاباز**

**شاواش** / şawaş/: ☜ **شاباش**

**شاوان** / şawan/: ناو. زەوینی بەردەڵان 🕮 سنگلاخ

**شاوانە** / şawane/: ☜ **شابانە**

**شاوانی** / şawanî/: ناو. دڵخۆشی؛ شادومانی 🕮 شادمانی

**شاوت** / şawit/: ناو. سوورەماسی؛ جۆرێ ماسی 🕮 نوعی ماهی

**شاوەدەر** / şaweder/: ☜ **شەوەر**

**شاور** / şawir/: ناو. ١. فیتوو؛ فیقە؛ فیتکە بە دەم ٢. ئامێری مۆسیقایی بایی 🕮 ١. سوت ٢. ساز بادی

**شاوڵ** / şawił/: ناو. شاقول؛ شاغوڵ؛ شاغووڵ؛ شاقووڵ؛ شاقۆڵ؛ ئامێرێک بۆ هەڵسەنگاندنی ترازی ئەستوونی، برێتی لە بەنێک کە کانزایەکی قورس و خڕ و نووک‌تیژی پێوە هەڵواسراوە 🕮 شاقول

**شاوە** / şawe/: ناو. مشوورخۆرە؛ خەمەخۆرە؛ شاهۆ؛ شاهوو؛ شاهوکە؛ شاڤ؛ شاڤە؛ شاڤ؛ واق‌واقکەرە؛ تووتەک؛ بۆتیمار؛ ویرغال؛ چرک؛ مەلوو؛ داوداوەکۆستە؛ باڵدارێکی گەورەی مل و قاچ درێژە، لە تۆرەمەی شاهۆ، نزیک ٧٥ سانتی‌میتر دەبێ، لاقی شین و گەورەیە، زگی قاوەیی پڕ خەت و خاڵە، ئەگەر هەست بە مەترسی بکا سەر قوت دەکا و جووڵە لە خۆ دەبڕێ، لە ناو قامیشەڵانی گەورە و قەراخ ئاو دەژی و هێلانە دەکا، لە لێلایی بەیانی و ئێواران دەخوێنێ و دەنگی وەکوو هەنیسکەی گریان وایە 🕮 حواصیل

**شاوەبۆگەنیو** / şawebogenîw/: ☜ **شاوەڕیخنە**

**شاوەبەڵەک** / şawebełek/: ☜ **شاوەسوڵتانی**

**شاوەت** / şawet/: ناو. *[شووڕەیی]* ١. ئاوی پشت؛ ئاوێ کە لە ڕەحەت بووندا دەڕژێ ٢. ئالۆش؛ هاش؛ هۆک؛ حەز و خواستی زۆری جینسی. هەروەها: **شاوەتی** 🕮 ١. منی ٢. شهوت

**شاوەجغەدار** / şawec(i)ğedar/: ☜ **شاوەزەردکە**

**شاوەرس** / şawers/: ☜ **شازادە**

**شاوەڕیخنە** / şaweřîxne/: ناو. شاوەبۆگەنیو؛

ڕیخنەخۆرە؛ باڵندەیەکە لە تۆرەمەی شاهۆ، نزیک ٥٠ سانتیمیترە، لە دوورەوە سپی دەنوێنێ، لاقی سوورە، زۆرتر لە ناو دەستەوڵاخ و دەسلەوەڕاندا دەبینرێ و کەمتر خۆ لە ئاو دەدا، هاوینان زۆرە ▣ گاوچرانک

**شاوەزەردکە** / şawezerdke/: ناو. شاوەزەردە؛ شاوەجغەدار؛ باڵندەیەکە لە تۆرەمەی شاهۆ، نزیک ٤٥ سانتیمیترە ، ڕەنگی قاوەیی مەیلەو زەردە، کاکۆڵێکی ڕەشی هەیە، قاچی سەوزە، دندووکیشی بە زستان سەوز دەبێ، لە ناو دار و قامیشەڵاندا دەژی ▣ حواصیل زرد

**شاوەزەردە** / şawezerde/: ☜ **شاوەزەردکە**

**شاوەسپیلکە** / şawes(i)pîlke/: ناو. باڵندەیەکە لە تۆرەمەی شاهۆ، نزیک ٩٠ سانتیمیترە، یەکدەس سپییە و لە لەکلەک گەورەتر، ملی زۆر درێژ، لاقی ڕەشی شینباو، دندووکی زەرد و سەری دندووکی ڕەشە، لە قەراخ ئاو دەژی و زستانان زۆرە ▣ اگرت بزرگ

**شاوەسوڵتانی** / şawesułtanî/: ناو. شاوەبەلەک؛ شاوەعەسلە؛ باڵندەیەکە لە تۆرەمەی شاهۆ، ٩٠ سانتیمیتر دەبێ، پشتی بۆر و سەر و ملی سپییە کاکۆڵی هەیە، دندووکی درێژ و لاقی قاوەیین، لە ناو ئاودا خۆ مەڵاس دەدا بۆ ڕاو، زستانان زۆرە ▣ حواصیل خاکستری

**شاوەشینکە** / şaweşînke/: ☜ **شاوەشینە**

**شاوەشینە** / şaweşîne/: ناو. شاوەشینکە؛ شینەشاوە؛ واقواقکەرە؛ خەمخۆرە؛ خەمەخۆرە؛ باڵندەیەکە لە تۆرەمەی شاهۆ، نزیک ٥٥ سانتیمیترە، لە باری ڕەنگەوە دوو جۆرن جۆری مەیلەو ڕەش و سپی، دندووکیان زەردی مەیلەو سەوزە، لاقیان ڕەش و پەنجەیان زەردە ▣ اگرت ساحلی

**شاوەعەسلە** / şawe'esłe/: ☜ **شاوەسوڵتانی**

**شاوی** / şawî/: ناو. دز؛ کەسێ کە کاری دزی کردنە ▣ دُزد

**شاویرۆڵ** / şawîroł/: ناو. بیمیشک؛ بیمشک؛ شابی ▣ بیدمشک

**شاوێڕ**[1] / şawêř/: ناو. ١. وردەزنە؛ چەند گۆلاوی بچووکی لە پەنا یەک ٢. ☜ **شاڤێڕ** ▣ ١. چند آبگیر کوچک مجاور هم ٢. ☜ **شاڤێڕ**

**شاوێڕ**[2]: ناوەڵناو. شاڤێڕ؛ زەینکوێر ▣ کودن

**شاه** / şah/: ناو. شا؛ پاتشا ▣ شاه

**شاهانە** / şahane/: ناوەڵناو. شایانە: ١. پێوەندیدار یان پاڵدراو بە شاوە ‹خواردنی شاهانە› ٢. وەک شا؛ بە ڕەوشی پاشایان ‹ئاکاری شاهانە› ٣. *[کنایە]* زۆر بەرز؛ هەڤیاز؛ شکۆدار ‹ژیانی شاهانە› ▣ ١تا٣. شاهانە

**شاهگێلە** / şahgêle/: ناو. مرۆچەی گەورە؛ مێرووە عەجەمانە ▣ مورچەی دُرُشت

**شاهنامە** / şahname/: ☜ **شانامە**

**شاهوکە** / şahuke/: ☜ **شاوە**

**شاهۆ** / şaho/: ☜ **شاوە**

**شاهوو** / şahû/: ☜ **شاوە**

**شاهەنشا** / şahenşa/: ناو. پاتشای پاتشایان ▣ شاهنشاه

**شاهەنگ** / şaheng/: ناو. دایکی مێشەنگوینان ▣ ملکەی زنبور عسل

**شاهی** / şahî/: ☜ **شایی ـ١و٤**

**شاهیک** / şahîk/: ناوەڵناو. بریقەدار؛ بەترووسکە ▣ درخشان

**شاهینە** / şahîne/: ناو. ١. خۆشی و شادی ٢. ژنی شا؛ شاژن ▣ ١. شادمانی ٢. ملکە؛ شهبانو

**شاهینەت** / şahînet/: ناو. شایی؛ بەزم و هەرای زەماوەند ▣ جشن عروسی

**شاهێن** / şahên/: ناو. ١. داری درێژی تەرازوو کە تاتەرازووی لێ قایمکراون ٢. زوانەی تەرازوو ٣.

مەلێکی ڕاوکەرە 🇮🇷 ١. شاهین ترازو ٢. زبانەی ترازو ٣. شاهین

**شایار** / şayar/: ☜ **شالیار-٢**

**شایان** / şayan/: ئاوەڵناو. شایەن؛ لایق؛ هێژا 🇮🇷 شایان؛ سزاوار

**شایانە**[1] / şayane/: ناو. بەزم و شاییێ کە بە بۆنەی ساڵەهاتی هاتنە دنیای شاوە بەڕێوە دەچێ 🇮🇷 جشن تولد شاه

**شایانە**[2]: ☜ **شاهانە**

**شایستە** / şayiste/: ئاوەڵناو. شاسە؛ شایسە؛ شیاو؛ شایان: ١. دۆخ یان چۆنیەتی شیاو بوون ‹پلەوپایەی شایستە؛ کاری شایستە› ٢. بەرکەتی؛ بەرکەفتی؛ خاوەنی کارایی یان لێهاتوویی ڕەچاوکراو ‹کرێکاری شایستە› ٣. هاوتەراز و هاوڕێ لەگەڵ کار یان ئامانجی دیاریکراودا ‹کردوکۆشی شایستە› 🇮🇷 ١تا٣. شایستە

**شایسە** / şayse/: ☜ **شایستە**

**شایعە** / şay(i)'e/: ناو. دەنگۆ؛ بەندوباو؛ بەنگ‌وباو 🇮🇷 شایعە

**شایک** / şayik/: ئاوەڵناو. ساف؛ حولی؛ لووس؛ بێ گرێ و گنج 🇮🇷 صاف

**شایلۆغان** / şayloğan/: ☜ **شایلەخان**

**شایلەخان** / şaylexan/: ناو. شایلەغان؛ شایلۆغان؛ بەزم و هەرای زەماوەند بە دەهۆڵ و زوڕناوە 🇮🇷 جشن عروسی همراه با دُهُل و سُرنا

**شایلەغان** / şayleğan/: ☜ **شایلەخان**

**شاینە** / şayne/: ☜ **شادانە**

**شاینەشەکێ** / şayneşekê/: ناو. جۆرێ ڕەقس و سەما 🇮🇷 نوعی رقص گروهی

**شایەت**[1] / şayet/: ناو. شایەد؛ شادە؛ ئاگادار لە ڕووداو 🇮🇷 گواه

⊡ **بە شایەت گرتن:** گرتنە شایەت؛ کردنە شایەت 🇮🇷 گواه گرفتن

**شایەت**[2]: ئاوەڵکار. شایەد؛ شایەتا؛ شایەدا؛ ڕەنگە؛ وێدەچێ؛ گاهەز؛ دوور نیيە 🇮🇷 شاید

**شایەتا** / şayeta/: ☜ **شایەت**[2]

**شایەتی** / şayetî/: ناو. ١. شایەدی؛ گوزارشی نووسراو یان زارەکی لە سەر ڕووداوێک ٢. پاتشایەتی 🇮🇷 ١. گواهی ٢. پادشاهی

⊡ **شایەتی دان:** شایەدی دان؛ شادە دان؛ خەبەر دان لە ڕووداو، بە نووسین یان زارەکی 🇮🇷 گواهی دادن

**شایەتیمان** / şayetîman/: ☜ **شاتیمان**

**شایەد** / şayed/: ☜ **شایەت**

**شایەدا** / şayeda/: ☜ **شایەت**[2]

**شایەدی** / şayedî/: ☜ **شایەتی-١**

⊡ **شایەدی دان:** ☜ **شایەتی؛ شایەتی دان**

**شایەر** / şayer/: ناو. ١. خۆوێژ؛ بوێژ؛ شاعیری نەخوێندەوار ٢. شاعیر ٣. گۆرانیبێژ ‹باسی شەو مەکە نە شایەری شەوم «سوارە»› 🇮🇷 ١. شاعر درس نخوانده ٢. شاعر ٣. ترانەخوان

**شایەن**[1] / şayen/: ناو. ١. شاهێنی تەرازوو ‹شایەن، شەرمی لە کەس نییە «مەسەل»› ٢. شیاوی؛ هێژایی 🇮🇷 ١. شاهین ترازو ٢. لیاقت

**شایەن**[2]: ☜ **شایان**

**شایی** / şayî/: ناو. ١. شاهی؛ پاتشایەتی ٢. زەماوەند؛ گۆڤەند ٣. دڵخۆشی؛ شادی ‹شایی بۆ دوانە و گڕ لە هەموانە «مەسەل»› ٤. شاهی؛ یەکەی پارەی ئێران لە سەردەمی قاجارەکاندا 🇮🇷 ١. پادشاهی ٢. مراسم عروسی ٣. شادی ٤. واحد پول ایران در دورەی قاجار

⊡ **شایی بەخۆ بوون:** بە حاڵی خۆ کەیفساز بوون ‹کە تۆ دەرپێت فڕێ دا و چاکەتی چاکت دە بەر خۆ کرد/ ئەمن شەرمم بە خۆ و شاییم بە خۆمە، جل‌شڕ و کوردم «هەژار، *بۆ کوردستان*»› 🇮🇷 بە وضع خود شاد بودن

**شایی پێ بون:** بە شتێ دڵخۆش بوون 🇮🇷 بە چیزی دل خوش داشتن

**شایی‌جندۆکان / şayîcindokan/:** ناو. گێژەڵووکە؛ گەردەلوول 🇮🇷 گردباد

**شاییش / şayîş/:** ناو. خەم؛ کەسەر؛ کول 🇮🇷 غم

**شاییکەر / şayîker/:** ناو. بەشدار لە زەماوەندا 🇮🇷 حاضر در جشن عروسی

**شاییگێڕ / şayîgêř/:** ناوەڵناو. بەزمگێڕ 🇮🇷 مُطرب

**شاییهێن / şayîhên/:** ناوەڵناو. هۆی بەدیهاتنی شادی و دڵخۆشی 🇮🇷 طرب‌انگیز

**شایێن / şayên/:** ناو. شاهێنی تەرازوو 🇮🇷 شاهین ترازو

**شب / şib/:** ئامراز. چون؛ وەک؛ وێنە 🇮🇷 مانند

**شباک / ş(i)bak/:** ناو. سەرپۆشی دەلاقەداری سەر گۆڕی چاکان 🇮🇷 ضریح

**شبان / ş(i)ban/:** چاوگ. وێک‌چوون 🇮🇷 شباهت داشتن

**شباندن / ş(i)bandin/:** چاوگ. ١. ناسینەوە؛ دیتن و کەوتنەوە بیر ٢. شوبهاندن؛ چواندنی کەس یان شتێک بە کەس یان شتی‌تر کە لە بڕێک تایبەتمەندیدا وەک یەکن ‹زانست بە چرا شباندن› 🇮🇷 ١. بازشناختن ٢. تشبیه کردن

**شبتی / şibtî/:** ☜ **شوتی**

**شبرەو / şibrew/:** ناو. شیبرەو؛ مێشن؛ تیماج؛ پێستی بزن و مەڕی لە دەباغ دراو کە سفت و پتەوە و بۆ چێ‌کرنی کیف، کەوش، کەمەربەند و... بەکار دەچێ 🇮🇷 چرمِ شیرو

**شبری / şibrî/:** ناو. کورتان؛ کۆپان 🇮🇷 پالان

**شبی / ş(i)bî/:** ئامراز. شب؛ وەکوو؛ وەکی؛ لە چەشنی 🇮🇷 همانندِ؛ شبیهِ

**شپ / şip/:** دەنگەناو. خشە؛ دەنگی وێک‌کەوتنی شتی وشک وەک پووش و گەڵای وشک 🇮🇷 خِش‌خِش

**شپرز / ş(i)pirz/:** ☜ **شپرزە**

**شپرزان / ş(i)pirzan/:** چاوگ. تیچان؛ بڵاو بوونەوە 🇮🇷 پراکندە شدن

**شپرزە / ş(i)pirze/:** ناوەڵناو. شپرز؛ شپرێو؛ شەپرێو؛ شەپرزە؛ شەرپەزە: ١. پەرژ و بڵاو ‹ماڵی شپرزە› ٢. شاپرز؛ شاپرزە؛ شاپرزا؛ شێواو و پەرێشان ‹ساقی شپرزەم بە دەس دنیاوە/ بە دەس مەینەت و جەور و جەفاوە «ئەخۆل»› 🇮🇷 ١. پراکندە؛ بەهم ریختە ٢. پریشان حال

**شپرزەکاری / ş(i)pirzekarî/:** ناو. کاری ئاڵۆز و بێ‌سەرەوبەرە 🇮🇷 آشفتە‌کاری

**شپرزەیی / ş(i)pirzeyî/:** ناو. تەرف‌تین؛ ئاڵۆزکاوی؛ ئاڵۆزاوی 🇮🇷 ازهم‌پاشیدگی

**شپرزی / ş(i)pirzî/:** ☜ **پەرێشانی**

**شپرزیاگ / ş(i)pirzyag/:** ناوەڵناو. شەپرزیاگ: ١. پرژوبڵاو؛ تێکەڵ‌وپێکەڵ ٢. لێ‌شێواو و پەرێشان 🇮🇷 ١. پراکندە و نامرتب ٢. پریشان

**شپرزیان / ş(i)pirzyan/:** چاوگ. شەپرزیان: ١. پرژوبڵاو بوون؛ تێکەڵ‌وپێکەڵ بوونەوە ٢. لێ‌شێویان؛ پەرێشان بوون 🇮🇷 ١. درهم و برهم شدن ٢. پریشان شدن

**شپرێو / şiprêw/:** ☜ **شپرزە**

**شپک / ş(i)pik/:** ☜ **شپنە ـ٢**

**شپل / ş(i)pil/:** ناو. ساوای تازەزاو 🇮🇷 نوزاد

**شپڵۆخ / şipłox/:** ناوەڵناو. شپرز: ١. شڵەژاو؛ شێواو ٢. پرژوبڵاو. هەروەها: **شپڵۆخی** 🇮🇷 ١. آشفتە ٢. بەهم ریختە

**شپنە / şipne/:** ناو. ١. ئامرازی بنەبڕ کردن ٢. شپک؛ شفنە؛ خێشک 🇮🇷 ١. ابزار ریشە‌کنی ٢. مالەی شُخم صاف‌کن

**شپەستە / ş(i)peste/:** ناو. کار و ڕەوتی ڕاواندنی نەخۆش؛ قسە پەڕاندن 🇮🇷 هذیان‌گویی

**شپەشپ / ş(i)peşip/:** دەنگەناو. خشەخش 🇮🇷

خش-خش

**شپی** / ş(i)pî/: ناو. ڕێژنە؛ ڕەهێڵە ☰ رگبار تُند باران

**شپین** / ş(i)pîn/: چاوگ. دادانی ڕێژنـەی بـاران ☰ رگبار گرفتن

**شت** / şit/: نـاو. ١. ششـت؛ تشـت؛ ئەشـت؛ چـت؛ چشت ‹چوار شتـن ئەمرۆکە بوونە نەگبەتیی کوردی هەژار/ جەهل یەک، بێعەقلـی دوو، دڵپیسـی سـێ، داوا چـوار «قـانع»› ٢. مـووی ڕاسـت و لـوول نەخواردوو ٣. کاری شـۆردن ☰ ١. چیـز ٢. مـوی صاف و بدون پیچش ٣. عمل شُستن

▣ **شتێک بە شتێک کردن:** کـارێکی گرنـگ و ئـەوتۆ کـردن ‹ئەگـەر خوێنـدبام دەمتـوانی شـتێک بـە شتێک بکەم «هـێمن»› ☰ کـار مُهـم و آنچنـانی کردن

**• شت** / -işt/: پاشگر. ش؛ نیشـانەی نـاوی چـاوگ ‹برشت؛ خۆرشت› ☰ پسوند نشانەی اسم مصدر

**شتاق** / ş(i)taq/: جێناو. هیچکام؛ هیچکامـە؛ نـەیی ☰ هیچکدام

**شتانێ** / ş(i)tanê/: ☜ **سنجووق**

**شتران**[1] / şitran/: چـاوگ. تێنەپەڕ. نادیـار. //شـترای؛ دەشتریی؛ بشـترێ// شـۆران؛ شـۆردران ☰ شُسـته شدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: شـتراو/ چـاوگی نـەرێنی: نەشتران.

**شتران**[2]: ☜ **شاخەشینکە**

**شتراو** / şitraw/: ئاوەڵـناو. شـۆردراو؛ شـۆریاگ ☰ شُسته

**شترمر** / ş(i)tirmir/: ناو. ئـاگرخۆرە؛ حوشـترمەل؛ حوشترمرخ؛ وشترمل؛ کەردیکل ☰ شُترمُرغ

**شترنج** / şitrinc/: ☜ **شەترەنج**

**شتری** / şitrî/: نـاو. شـرک؛ گێلگێلـە؛ ڕیـزە گوڵینگەی سەری ژنان ☰ ردیف منگولـەی زینتـی سر زنان

**شتزان** / şitzan/: ☜ **زانا ـ١**

**شتزۆری** / şitzorî/: نـاو. شـوولگ؛ فـەرحانی ☰ فراوانی

**شتل** / ş(i)til/: ☜ **شەتڵ**[1]

**شتلاندن** / şitlandin/: چاوگ. چەقاندنی شـتل ☰ نشاندن نشا

**شتلین** / şitlîn/: چـاوگ. دە زەوی چـەقین ☰ بـە زمین فروشدن؛ نشانده شدن

**شتڵ** / şitił/: ☜ **شەتڵ**[1]

**شتڵجاڕ** / şitiłcař/: ☜ **شەتڵجاڕ**

**شتمەک** / şitmek/: ☜ **شتومەك**

**شتمەکە** / şitmeke/: ☜ **شتومەك**

**شتن** / ş(i)tin/: ☜ **شۆردن**

**شتنەوە** / şitnewe/: ☜ **شۆردنەوە**

**شتوشۆ** / şit û şo/: ناو. شـرتوشـۆ؛ شسـتوشـۆ؛ شوستوشۆ؛ شوسوشۆ؛ باڵاو؛ کـاری شـۆردن ☰ شُستشو

▣ **شتوشۆ دەرێنـان:** /کنایـە/ شـرتوشـۆ دەرێنـان؛ شرتوشۆ لێبردن؛ شوستوشۆ دان؛ شۆردنەوە؛ جنێوی زۆر پێدان ☰ زیر دُشنام گرفتن

**شتومەک** / şit û mek/: ناو. چتومەک؛ شـتمەک؛ شتمەکە ☰ اسباب و اثاث

**شتۆ**[1] / ş(i)to/: ئاوەڵکار. چلـۆن؛ چـۆن؛ شـتەو ☰ چگونه

**شتۆ**[2]: دەنگ. وشەی دنـەدانی سـەگ بـۆ شـەڕ ☰ کلمەی تحریک سگ برای جنگ

**شتۆک** / ş(i)tok/: نـاو. ئـاوی لـە دۆ تکـاوی کوڵێندراو، کە دەرمانی تاوانگازە ☰ آب چکیـده از دوغ جوشیده که داروی آفتابزدگی است

**شتۆکە** / ş(i)toke/: نـاو. چشـتی چکۆلـە ☰ چیـز کوچک؛ چیزک

**شتو**[1] / ş(i)tû/: ناو. جۆرێ هەرمێ ☰ نوعی گلابی

**شتو**[2]: ئاوەڵناو. شۆردراو؛ بـە ئـاو خاوێنـەوەکراو ☰

شُسته

**شتوڤ** / ş(i)tûv/: ناو. زەنگەتەترێ؛ تلیسک؛ تیسک 🇮🇷 تلسک

**شتەکە** / ş(i)teke/: جێناو. ئەوەکە؛ ئەوی خۆمان دەیزانین 🇮🇷 فلان

**شتەو** / ş(i)tew/: ☜ شتۆ[1]

**شتەی** / ş(i)tey/: چاوگ. شتن؛ شۆردن 🇮🇷 شُستن

**شتی**[1] / ş(i)tî/: ☜ شوتی

**شتی**[2]: ئامراز. وەکوو؛ وێنەی 🇮🇷 مانندِ

**شتیار**[1] / şityar/: ئاوەڵناو. بێ‌پێخەف؛ بێ‌سەرنناز ‹هەژارەکی شتیارە› 🇮🇷 آسمان‌جُل

**شتیار**[2]: ئاوەڵکار. بە بێ پێخەف و سەرەنناز ‹ئەز و لۆ شتیار نفستم!› 🇮🇷 بی وسیله‌ی خواب

**شتیر** / ş(i)tîr/: ناو. شینکە و چیمەنی قەراخ ئاو و کانی لە چیادا 🇮🇷 سبزه‌ی کنار چشمه

**شتیکانێ** / ş(i)tîkanê/: ناو. مەتەڵ؛ مەتەڵۆکە؛ شتێکانی 🇮🇷 چیستان؛ مُعما

**شتین** / ş(i)tîn/: ئاوەڵناو. چکووس؛ ڕژد؛ ڕەزیل؛ دەس قووچاو؛ پیسکە 🇮🇷 خسیس

**شتێکانی** / ş(i)têkanî/: ☜ شتیکانێ

**شحنە** / şiĥne/: ناو. داڕۆغە؛ دارغە؛ سەرپەرشتی پاسەوانان 🇮🇷 شَحنه

**شخاب** / ş(i)xab/: ناو. شخاڤ؛ مەتکەو؛ کونکەرە 🇮🇷 متّه

**شخاتە** / ş(i)xate/: ☜ شەمچە

**شخارتە** / ş(i)xarte/: ☜ شەمچە

**شخاڤ** / ş(i)xav/: ☜ شخاب

**شخاوتە** / ş(i)xawte/: ناو. شەمچە؛ شخاتە؛ شقاڵتە 🇮🇷 کبریت

**شخب** / şix(i)b/: دەنگەناو. خوشەی شیر کاتی دۆشین، کە دەڕژێتە ناو دەفرەوە 🇮🇷 صدای شیر هنگام دوشیدن

**شخت** / şixt/: ناو. زەرگی دەروێشان 🇮🇷 سیخ دراویش

**شختە** / şixte/: ☜ شەختە

**شخرە** / şixre/: ☜ شەغرە

**شخرەکێش** / şixrekêş/: ☜ شەغرەکێش

**شخل** / şixl/: ناو. کەڵەکە؛ کەڵەک لە سەر یەک؛ چۆنیەتی بە سەر یەکا هاتن 🇮🇷 انباشتگی

**شخلی** / şixlî/: ئاوەڵناو. بەسەر یەکا هاتوو؛ کەڵەکبوو 🇮🇷 انباشته

**شخلین** / şixlîn/: چاوگ. بە سەر یەکا کەڵەک بوون 🇮🇷 انباشتن

**شخڵ** / şixił/: ناو. شڵخە؛ کەڵەک لە سەر یەک 🇮🇷 بر هم انباشتگی

**شخۆ** / ş(i)xo/: ☜ ژخۆ

**شخەڵ** / ş(i)xeł/: ناو. شەخەڵ: ١. ئەشخەڵ؛ دەوەنجاڕ ٢. خیزەڵان؛ زیخەڵان ٣. بێشەی چڕی دەم ڕووبار ٤. شێخەڵ؛ کاری پەرتاوتنی لکی دار ٥. زبڵوزاڵ 🇮🇷 ١. بوتەزار ٢. شنزار ٣. بیشه‌ی انبوه کنار رود ۴. هرس درخت ۵. آشغال

**. شد** / şid/: ☜ شەد

**شداندن** / ş(i)dandin/: چاوگ. توند بەستن 🇮🇷 مُحکم بستن

**شرپ** / şirp/: دەنگەناو. دەنگی وەک دە ئاو کەوتنی شتی سەنگین 🇮🇷 صدای مانند در آب افتادن جسم سنگین

**شرت**[1] / şirt/: ناو. ١. دەوەنێکە لقەکانی دەکەنە گەسک ٢. چەڵغوو؛ چەرغوو؛ گەسک لە ساقەتەی ناسک و تەڕ 🇮🇷 ١. درختچه‌ای است ٢. جاروی ترکه‌ای

**شرت**[2]: لێل. ← شرت‌وگوم

**شرتک** / şirtik/: ناو. خەڵفەمێو 🇮🇷 جوانه‌ی تاک

**شرتوشۆ** / şirt û şo/: ☜ شت‌وشۆ

⊡ **شرتوشۆ دەرێنان**: ☜ شت‌وشۆ دەرێتان

**شرتوشۆ لێبردن**: ☜ شت‌وشۆ دەرێتان

**شرت‌وشۆ لێ برین**: ئابڕوو پێوە نەهێشتن ☰ آبـرو برای کسی نگذاشتن

**شرت‌وگوم** / şirt û gum/: ئاوەڵناو. بێ سەروشـوێن؛ سـەرداگوم؛ نادیـار و ون ‹هـاتووم خواحـافیزی یەکجاریت لێ دەکەم و سەری خۆم هەڵدەگرم، بزانم لە کوێ شرت‌وگوم دەبم «هەژار، چێشتی مجێـور»› ☰ گم‌وگور

**شرتۆپ** / şirtop/: دەنگەناو. دەنگـی بـە زەمینـدا کەوتنی شتی نەرم و سـەنگین ☰ صـدای افتـادن جسم نرم و سنگین

**شرتەشـرت** / şirteşirt/: ئاوەڵـکار. بـــە پەلـــە و شپرزەییەوە ☰ با شتاب و آشفتگی

**شردان** / şirdan/: نـاو. گۆشـتی ئیشـک‌کـراو بـۆ زستان ☰ گوشت خشک شده برای زمستان

**شردن** / şirdin/: ☜ **شۆردن**

**شردنەوە** / şird(i)newe/: ☜ **شۆردنەوە**

**شـردوو** / şirdû/: ئاوەڵـناو. شـــۆردراو؛ بـــە ئـــاو خاوێنەوەکراو ☰ شُسته

**شرژاو** / şirjaw/: ئاوەڵناو. پێکەوتوو؛ لایق ☰ سزاوار

**شرش** / şirş/: نـاو. کەلوەپـەمۆ؛ پـەمۆی پێچـراوی گلۆلەکراو ☰ غُنده؛ غوزەی پنبه

**شـرقە** / şirqe/: نـاو. قرمـە؛ ڕەشـۆکی؛ جـۆرێ تفەنگی ڕاو ☰ نوعی تفنگ شکاری

**شرک** / şirk/: ناو. ۱. پلووسک؛ لووسـاوک؛ لـووس ۲. ☜ **شتری** ☰ ۱. ناودان ۲. ☜ **شتری**

**شرکاک** / şirkak/: ناو. شلکاک؛ مەلێکـە لـە کـۆتر پچووکتر و گۆشت ناخۆش ☰ پرندەای کـوچکتر از کبوتر و بدگوشت

**شرماپ** / şirmap/: نـاو. شرن؛ زللە؛ زیللە؛ شەپلاغە ☰ سیلی

**شرن** / şirn/: نـاو. ۱. شفرە؛ ددانی زەقی یەکانە ۲. ☜ **شـرماپ** ☰ ۱. نـیش برآمـدەی گـراز ۲. ☜ **شرماپ**

**شرنگ** / ş(i)ring/: دەنگەناو. دەنگی کەوتنی شـتی قورس ☰ صدای افتادن جسم سنگین

▣ **شرنگ (لـێ) دان**: تەکان لێ دان؛ هەوڵ دان بـۆ جێبەجێ کردنی کارێ، بەبێ تەواو کـردنی ☰ کار را زخمی کردن

**شرنگە**[1] / ş(i)ringe/: نـاو. ۱. دۆخـی شـەلین ۲. شنگڵ؛ بزاوی کاتی کـار کـردن (وەک: شـرنگەی شاتر کاتی نان کردن) ☰ ۱. لنگیـدن ۲. تکـان حـین انجام کار

**شرنگە**[2]: دەنگەناو. دەنگی لێک‌دانی شیر و خەنجەر ☰ چکاچک سلاح سرد

**شرنگەشـــرنگ** / ş(i)ringeş(i)ring/: ئاوەڵـــکار. شەلەشەل؛ لارەلار ☰ لنگ ـ لنگان

**شروە** / şirwe/: ناو. ئاوێز؛ ئاوێزە ☰ آویزە

**شروەهەلاڵێ** / şirwehełalê/: نـاو. گوڵێکە ☰ گُلـی است

**شرۆچی** / ş(i)roçî/: ☜ **شرۆڤەکار**

**شرۆڤە** / ş(i)rove/: ناو. ۱. ڕاڤـە؛ ڕاژە؛ ئـەوەی بـۆ ڕاگەیانـدنی ڕووداوێـک، دۆخـێ یـان وتەیـەک دەگـوترێ ‹شرۆڤـەی هەواڵـەکان› ۲. شڵـێوە؛ دوودانگ؛ بارینی بەفر و باران پێکەوە ☰ ۱. شرح و تفسیر ۲. برف و باران با هم

**شرۆڤەکار** / ş(i)rovekar/: نـاو. ڕاژەکـار؛ ڕاڤـەکار؛ شرۆچی ☰ مُفسر

**شـروو** / ş(i)rû/: نـاو. دارێکـە بـە گـەڵای پـان و خەزەڵوەر، چێوی سپی و پتـەو کـە لـە هەمبـەر سەهۆڵبەندان، لافاو، کرێوە و پیسـی هـەوادا زۆر خۆڕاگرە ☰ کرب

**شرەقیان** / ş(i)reqyan/: چـاوگ. درز تـێ‌کـەوتن؛ درز بردن ☰ شکافتن

**شریت** / ş(i)rît/: نـاو. ۱. گشتەک؛ بەنی چەند لۆی لێـک بـادراو ۲. کاسـێت؛ نـەواری زەبـت ☰ ۱. رشتەی تابیده ۲. نوار کاست

**شریته** / ş(i)rîte/: ناو. زنجیره 🇮🇷 زنجیره

**شریخ** / ş(i)rîx/: ☜ **شریخه**

**شریخان** / ş(i)rîxan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //شریخای؛ دەشریخێی؛ بشریخێ// شریخە لێ هانن؛ گرمە کردن 🇮🇷 غُرّش کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەشریخان

**شریخاندن** / ş(i)rîxandin/: چاوگ. تێنەپەڕ. //شریخاندت؛ دەشریخێنی؛ بشریخێنە// شریخانن؛ گرماندن ‹هەورەتریشقە شریخاندی› 🇮🇷 غُریدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەشریخاندن

**شریخانن** / ş(i)rîxanin/: ☜ **شریخاندن**

**شریخوهۆڕ** / ş(i)rîx û hoř/: دەنگەناو. گرمە و گوڕە؛ شریخەشریخ؛ گرمەی بە شوێن یەکا 🇮🇷 غُرش پیاپی

**شریخه** / ş(i)rîxe/: دەنگەناو. شریخ؛ شریق؛ شریقە؛ گرمە؛ دەنگی زۆر توند و لەپڕ وەک دەنگی هەور ‹شاخەی شریخەی بزیسکەی دەروون/ نە چەم شەتاوان جاری کەرد چوون هەوون «مەولەوی»› 🇮🇷 صدای رعدآسا

**شریخەشریخ** / ş(i)rîxeşrîx/: ☜ **شریخوهۆڕ**

**شریژ** / ş(i)rîj/: ناو. شرێس؛ ئەسریلک؛ چرێش؛ سریش 🇮🇷 سریش

**شریش** / ş(i)rîş/: ☜ **سرێش**

**شریق** / ş(i)rîq/: ☜ **شریخه**

**شریقه** / ş(i)rîqe/: ☜ **شریخه**

**شریک** / ş(i)rîk/: ناو. ١. هاوبەش ٢. ئاواڵ؛ هاوڕێ 🇮🇷 ١. شریک ٢. همراه

**شرین** / ş(i)rîn/: ☜ **شیرین**

**شرینقه** / ş(i)rînqe/: ناو. ئاودووزەک؛ ئابدۆزەک؛ سرینگ؛ ترومپایەکی بچووکی گرۆڤەرە لە ماکێکی ڕوون، وەک شیشە یان پلاستیک، بە سەری دەرزیدارەوە، بۆ تێراکردنی دەرمان یان دەرکێشانی تراو لە لەشی گیاندار 🇮🇷 سُرنگ

**شرینقەوەشێن** / ş(i)rînqeweşên/: ناو. دەرزیوەشێن؛ ئەو کەسەی دەرزی لە نەخۆش دەدا 🇮🇷 تزریقاتی

**شریه** / şirye/: ناو. تەنکە بەزی ژێر پێست 🇮🇷 لایەی پیه زیر پوست

**شرێخنای** / ş(i)rêxnay/: چاوگ. شریخاندن 🇮🇷 غُریدن

**شرێخیای** / ş(i)rêxyay/: چاوگ. شریخان 🇮🇷 غُرش کردن

**شرێس** / ş(i)rês/: ☜ **شریژ**

**شڕ**[1] / şiř/: ناو. ١. بەرگی دڕاو ٢. *[ناشیرین]* شیر؛ جرت؛ زڕت 🇮🇷 ١. لباس پاره ٢. شیشکی

**شڕ**[2]: ئاوەڵناو. شوڕ: ١. دڕاو؛ دڕیاگ ٢. پەشێو؛ پەرێشان؛ بێسەروبەر ‹حاڵم شڕە› 🇮🇷 ١. پاره ٢. پریشان

**شڕشڕ**[1] / şiřşiř/: ئاوەڵناو. زۆر کۆن و دڕاو 🇮🇷 بسیار کهنه و پاره

**شڕ ـ شڕ**[2]: دەنگەناو. دەنگی ڕژانی ئاو 🇮🇷 شُر ـ شُر آب

**شڕشێت** / şiřşêt/: ☜ **شڕوشێت**

**شڕکەلان** / şiřkelan/: ناو. تۆقەلان؛ پارچەلان؛ ئەو شوێنە هەڵوەشاوەی ماشێنەشکاوی لێ ڕۆ دەکەن 🇮🇷 اوراقی

**شڕمبڕم** / şiřmbiřm/: ئاوەڵناو. بێتام و بێمانا 🇮🇷 یاوه و مُفت

**شڕنەوپڕنە** / şiřne w piřne/: ئاوەڵناو. چڕنەوپڕنە؛ هەرچی و پەرچی ‹شڕنەوپڕنەی تێ ڕژابوو!› 🇮🇷 ناچیز و بی‌ارزش

**شڕوپەتۆر** / şiř û petor/: ئاوەڵناو. شڕودڕ؛ شڕوشیتاڵ 🇮🇷 پاره‌پوره

⊡ **شڕوپەتۆر کردن:** لەتوکوت کردنی جلک کە چاک نەکرێتەوە 🇮🇷 پاره ـ پوره کردن

**شڕ و دڕ** / şiř û diř/: ئاوەڵناو. ١. لەت ـ لەت و پارچە ـ پارچە؛ زۆر دڕاو ٢. *[کینایە]* بێحەیا و

زمانپیس 🇮🇷 ١. پاره ـ پاره ٢. بی‌ادب و بدزبان

**شڕودڕپۆش** / şiř û diř poş/: ئاوەڵناو. تەقەڵۆ؛ شڕەبار 🇮🇷 ژنده‌پوش

**شڕوشاتاڵ** / şiř û şatał/: ناو. خڕەوپڕە؛ چەکوپووش؛ خرت‌وپرت 🇮🇷 خرت‌وپرت

**شڕوشالات** / şiř û şałat/: ناو. چەشە؛ ئەوەی لەگەڵ چێشتدا دەیخۆن ‹نەهارێکی کەبابی بەرخ و تاچین و شڕوشالات/ لەگەڵ عەسرانە تۆراغ و لەگەڵ سوبحانە قەیماغی «حەقیقی»› 🇮🇷 مُخلفات

**شڕوشپڕێو** / şiř û şipřêw/: ئاوەڵناو. پەرژ و بڵاو؛ دەمار لێ دەرهاتوو ‹لەشکری شڕوشپڕێو› 🇮🇷 تارومار

**شڕوشیتاڵ** / şiř û şîtał/: ئاوەڵناو. شڕەوشیتاڵ؛ شڕ و وڕ؛ زۆر دڕاو 🇮🇷 پاره و فرسوده

**شڕوشێت** / şiř û şêt/: ئاوەڵناو. شێت‌وشڕ؛ شڕشێت؛ نەگونجاو 🇮🇷 نامُتعادل

**شڕووڕ** / şiř û wiř/: ☜ **شڕوشیتاڵ**

**شڕووڕکراو** / şiř û wiřk(i)raw/: ئاوەڵناو. هەڵپەڕتاندی 🇮🇷 تکه‌پاره شده

**شڕۆ** / ş(i)řo/: ☜ **شڕۆڤە**

**شڕۆڤە** / ş(i)řove/: ناو. شڕۆ: ١. کاری لێکدانەوەی خەو ٢. ڕاڤە؛ کاری لێکدانەوە؛ شی کردنەوە (بەتایبەت ڕووداوی سیاسی) 🇮🇷 ١. تعبیر خواب ٢. تفسیر سیاسی

**شڕۆڤەکار** / ş(i)řovekar/: ناو. شڕۆڤەکەر؛ شڕۆکەر: ١. لێکدەرەوەی خەون ٢. کەسێ کە لە سەر هۆ، ئەنگێزە و ئاکامی ڕووداوان بڕوا و لێکیان بداتەوە. هەروەها: **شڕۆڤەکاری** 🇮🇷 ١. مُعبر ٢. مُفسر

**شڕۆڤەکەر** / ş(i)řoveker/: ☜ **شڕۆڤەکار**

**شڕۆکەر** / ş(i)řoker/: ☜ **شڕۆڤەکار**

**شڕۆڵ** / ş(i)řoł/: ئاوەڵناو. ١. شڕەبار؛ شڕەلەبەر ‹هەر بەرگێ دەکەیتە بەر شڕۆڵان/ پێت دینە گەشە و بزە، کلۆلان «هەژار، مەم‌وزین»› ٢. کوت‌ولەت؛ لەتارـ لەتار؛ گنجڕ و دڕاو 🇮🇷 ١. ژنده‌پوش ٢. پاره ـ پوره

**شڕۆڵی** / ş(i)řołî/: ناو. ١. بارودۆخی شڕۆڵ بوون ‹چۆن بەم شڕۆڵییە سەرمای نابێ!› ٢. دڕاوی ‹بای بەیان شڕۆڵی جل‌وبەرگەکەی ڕانەشەکاند «سوارە»› 🇮🇷 ١. ژنده‌پوشی ٢. پارگی

**شڕە**[١] / ş(i)ře/: ناو. ١. *[کینایە]* کەلەپوور؛ میرات ٢. *[کینایە]* جلک؛ بەرگ؛ لیباس ٣. کەل‌وپەل؛ ناوماڵ ٤. جلکی دڕاو ٥. کون؛ کونا 🇮🇷 ١. مُردەریگ؛ ماترک ٢. البسه ٣. اثاثیه ٤. لباس مُندرس ٥. سوراخ

⊡ **شڕە گێڕانەوە:** *[کینایە]* گرتنە دەستی کاروباری ژیانێکی ساکار 🇮🇷 زندگی ساده‌ای را اداره کردن

**شڕە**[٢]: ئاوەڵناو. ١. بێ‌نرخ؛ بێ‌بایەخ ٢. شڕ؛ دڕاو 🇮🇷 ١. بی‌ارزش ٢. کهنه

**شڕە**[٣] ـ: پێشوشە. بێ‌نرخ ‹شڕەبار؛ شڕەخۆر› 🇮🇷 بی‌ارزش

ـ **شڕە**[٤]: پاشەوشە. دڕاو ‹جلەشڕە؛ کەوشەشڕە› 🇮🇷 پاره

**شڕەبار** / ş(i)řebar/: ☜ **شڕەپۆش**

**شڕەپۆش** / ş(i)řepoş/: ئاوەڵناو. شڕەبار؛ جلی شڕ لە بەر 🇮🇷 ژنده‌پوش

**شڕەخۆر** / ş(i)řexor/: ئاوەڵناو. سیرمەخۆر؛ گەنەدز؛ کەردز؛ هووردز؛ دەڵەدز؛ کەفەن‌دز؛ هۆگر و خووگرتووی دزینی شتی بێ‌نرخ 🇮🇷 دله‌دزد

**شڕەخۆری** / ş(i)řexorî/: ناو. قاچوقووچ؛ سیرمەخۆری 🇮🇷 دله‌دُزدی

**شڕەق** / ş(i)řeq/: ناو. درز؛ قەڵش 🇮🇷 ترک؛ درز

**شڕەقیان** / ş(i)řeqyan/: چاوگ. درز بردن؛ قەڵش بردن 🇮🇷 ترک برداشتن

**شڕەگر** / ş(i)řegir/: ناو. میراتگر 🇮🇷 وارث

**شڕەلەبەر** / ş(i)řeleber/: ☜ **شڕۆڵ**

**شڕەوبڕە** / ş(i)ře w b(i)ře/: ناو. شڕەومڕە: ١. کووتاڵی جلک ٢. خڕەوپڕەی ناو ماڵ 🇮🇷 ١.

پارچەی لباس ٢. خرتوپرت

**شڕەوپڕە** / ş(i)ře w piře/: ناو. جلکی کۆنـە و دڕاو ☰ لباس‌های مُندرس

**شڕەوشیتاڵ** / ş(i)ře w şîtał/: ☜ شڕوشیتاڵ

**شڕەومڕە** / ş(i)ře w m(i)ře/: ☜ شڕەوپڕە

**شڕها** / şiřha/: دەنگ. [ناشیرین] شـڕهاو؛ تـڕحێو؛ وشەی گاڵتە پێ‌کردن ☰ زِکی

**شڕهاو** / şiřhaw/: ☜ شڕها

**شڕین** / ş(i)řîn/: چاوگ. داڕژانی ئاو ☰ شُر ــ شُر ریختن آب

**شژ** / şij/: ناو. ١. شاخەشینکە؛ بەردی سووکەڵەی ناسک و تورت ٢. کێم و زووخ ٣. ڕاو؛ شکار ☰ ١. سنگریزە ٢. چرک زخم ٣. شکار

**شژڕێژ** / şijřêj/: نـاو. سـەربانێ کـە ورکەبـەردی ناسکی لە سـەر ڕۆ کـراوە و کوتراوەتـەوە ☰ بـام پوشیده از سنگریزه

**شست** / şist/: ئاوەڵناو. سس؛ سست ☰ سُست

**شستوشۆ** / şist û şo/: ☜ شت‌وشۆ

**شش** / şiş/: ئاوەڵناو. [منداڵانە] شاردراوە؛ شـاریاوە ☰ پنهان

⊡ **شش کردن**: [منداڵانە] شاردنەوە ‹مێوژت دەدەمـێ ششی کە با نەیبینن› ☰ پنهان کردن

**ششت** / şişt/: ☜ شت ــ١

**ششتن** / şiştin/: ☜ شۆردن

**ششتنەوە** / şişt(i)newe/: ☜ شۆردنەوە

**ششتو** / şiştû/: ئاوەڵناو. شردوو؛ بە ئاو خاوێن‌کـراو ☰ شُستە

**ششـو** / şişû/: ئاوەڵـناو. ئەسـپێون؛ سـپێون؛ ئەسپێون؛ ڕشکۆ؛ ڕشکن ☰ شپشو

**شعور** / ş(i)'ûr/: ناو. ١. هزر؛ هۆش ٢. ئـاوەز؛ فـام ☰ ١و٢. شُعور

**شعەفی** / ş'efî/: ناو. جۆرێ ترێ ڕەشـکە ☰ نـوعی انگور سیاه

**شغاب** / ş(i)ğab/: ناو. سمە؛ سمبە؛ مەتکەو ☰ متّە

**شغاتە** / ş(i)ğate/: ☜ شەمچە

**شغارتە** / ş(i)ğarte/: ☜ شەمچە

**شفا**[١] / ş(i)fa/: نـاو. شیفا؛ مفا؛ مـەفا؛ موفـا؛ ڕەوتی چا بوونەوە لە نەخۆشی ‹خوا شفای بـدا!› ☰ شَـفا؛ بهبود

⊡ **شفا دان**: چا کردنەوە؛ خۆشـەو کـردن ☰ شـفا دادن

**شفا**[٢]: ئاوەڵناو. خۆش‌کەرەوە ‹دەستی تۆ شـفایە› ☰ شفابخش

**شفات** / ş(i)fat/: نـاو. شـەفاعت؛ کـار و ڕەوتی پاڕانـەوە لـە کەسـێک بـۆ چاوپۆشـی کـردن لـە گوناهی کەسێکی‌تر ☰ شفاعت

**شفاتکەر** / ş(i)fatker/: ئاوەڵناو. تکاکار؛ بەرەوان ☰ شفیع

**شفت**[١] / şift/: نـاو. کـاری دۆشـینی شـیر ☰ عمـل دوشیدن شیر

**شفت**[٢]: لێل. ← شفتوشۆ

**شفتوشۆ** / şift û şo/: نـاو. شت‌وشۆ: ١. کـاری زۆر شـۆردنی جـلوبـەرگ و لاو و لووسـە دانی ٢. [مەجاز] کاری کەسێ بەر جنێو و قسەی ناشـیرین دان ☰ ١. شُست‌وشوی زیاد ٢. عمل لیچار بار کسـی کردن

**شفتە**[١] / şifte/: نـاو. ١. شـامی‌کـەباب ٢. حـەڕی خۆش‌نەکراو ٣. قسلاو؛ تێکەڵاوی زیـخ و قسلـی شـل و ئـاوەکی بـۆ بنـەڕەتی خـانوو ٤. مـووی شانەنەکراو ٥. کاری زارۆ لە بێشکە دەرهێنان ٦. کاری یەکەم جار موو لە سـەری زارۆ هەڵـپاچین ☰ ١. شامی‌کباب ٢. گِـل ناپُختـە ٣. شِـفته ۴. مـوی آشفته ۵. عمل بچه را از گهواره بیرون آوردن ۶. عمل نخستین بار موی سر بچه را کوتاه کردن

**شفتە**[٢]: ئاوەڵـناو. ١. تێکەڵ ـ پێکەڵ ٢. ولاشم؛ باز؛ بێ بەسەبەندی ‹چایی شفتە› ☰ ١. آمیخته و درهم

٢. فلّه

**شفته**[٢]: ئاوەڵکار. بەبێ بەسەبەندی ‹شفته سیمان دەفرۆشن› 🇮🇷 فلّه‌ای

**شفتەزێ / şiftezê/**: ئاوەڵناو. [بەلار] تایبەتمەندی ژنێ کە زۆر زگ‌وزا دەکا 🇮🇷 ویژگی زنی که زیاد زایمان کند

**شفتەژە / şifteje/**: ناو. [بەلار] شفتەژێ؛ زکپڕێ کە منالی شیرەخۆرەی هەبێ 🇮🇷 حامله‌ای که بچه‌ی شیرخواره دارد

**شفتەژێ / şiftejê/**: ☜ **شفتەژە**

**شفتی / siftî/**: ☜ **شوتی**

**شفتی‌تاڵک / siftîtałik/**: ☜ **کاڵەکەمارانه ـ١**

**شفتی‌تاڵه / siftîtałe/**: ☜ **کاڵەکەمارانه ـ١**

**شفتیک / siftîk/**: ناو. ١. کاری قەڵەمە لێدان ٢. کاری هەڵپەرتاوتن 🇮🇷 ١. عمل قلمه زدن ٢. هرس

**شفتیل / siftêl/**: ناو. تووڵی باریک و چیر کە بۆ سەبەتە چنین باشە 🇮🇷 ترکه‌ی نازک و نرم مناسب سبدبافی

**شفحەڵه / şifĥełe/**: ناو. بەری داری کفر 🇮🇷 ثمر درختچه‌ای است

**شفرە / şifre/**: ناو. ١. شرن؛ بڕڕەی بەراز ٢. ئاسنێکی دەسکداری دەم‌پانی تیژە بۆ چەرم برین ‹شفرەکەی هەڵگرت بۆ بریامانی/ چون ئیشی نەبوو هیچ لێی نەزانی «قانع»› ٣. درەوشەی کەتیرەکەران کە لە لاسکی گوێنی دەدەن ٤. ☜ **شەغرە** ٥. نەشتەری برینگەران 🇮🇷 ١. نیش برجسته‌ی گُراز ٢. شفره‌ی چرم‌بُری ٣. شفره‌ای که گون کتیرا را سوراخ می‌کند ٤. ☜ **شەغرە** ٥. تیغ جرّاحی

**شفسک / şifsik/**: ناو. چەقاڵە کێویلە 🇮🇷 چغاله‌ی کوهی

**شفیک / ş(i)fîk/**: ناو. گسک؛ گزک 🇮🇷 جارو

**شڤ / şiv/**: ناو. ١. تووڵ؛ تووڵ ٢. شیو؛ نەواڵ؛ دۆڵی زۆر پچووک لە چیا ٣. نشێو؛ لێژ؛ سەربەرەژێر ٤. ئێکەم کولانی دۆشاو 🇮🇷 ١. ترکه ٢. درّه‌ی کوچک ٣. نشیب ۴. اولین جوشیده‌ی شیره‌ی انگور

**شڤار**[١] **/ ş(i)var/**: ناو. ساوار 🇮🇷 بلغور

**شڤار**[٢]: ئاوەڵناو. درێژ؛ بڵند 🇮🇷 دراز

**شڤارۆک / ş(i)varok/**: ناو. زبارەی ساوار کوتان 🇮🇷 بلغورکوبی گروهی

**شڤارە / ş(i)vare/**: ئاوەڵناو. بڵندبالای ناقۆڵا 🇮🇷 دراز بدقواره

**شڤاڕێ / ş(i)vařê/**: ناو. شڤیلە؛ شڤەڕێ؛ ڕچە؛ ڕێچکە؛ تووڵەڕێ؛ ولاخەڕێ 🇮🇷 راه باریک مالرو

**شڤاک / ş(i)vak/**: ☜ **شەڤت**[١]

**شڤان / ş(i)van/**: ☜ **شوان**

**شڤانخاپێن / ş(i)vanxapên/**: ☜ **شوانخڵەتێنە**

**شڤاندیلکە / ş(i)vandîlke/**: ناو. مەلیچک؛ چۆلەکە؛ پاساری 🇮🇷 گُنجشک

**شڤانکوژ / ş(i)vankuj/**: ☜ **شوانخڵەتێنە**

**شڤانی / ş(i)vanî/**: ☜ **شوانی**

**شڤتاندن / ş(i)vtandin/**: چاوگ. لە سەرەوە بۆ خوار دادڕاندن 🇮🇷 از بالا به پایین شکافتن

**شڤر / şivr/**: ناو. جۆرێ کەڵەکێوی 🇮🇷 نوعی بُز کوهی

**شڤرشکی / şivrişkî/**: ئاوەڵناو. کوێر؛ کۆر 🇮🇷 کور

**شڤژ / şivij/**: ناو. شژ؛ شاخەشینکە 🇮🇷 پُلمه سنگ تُرد

**شڤش / şiviş/**: ☜ **شمش ـ٢**

**شڤشینک / şivşînik/**: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی دارێ کە گەڵا ناوەرێنێ 🇮🇷 همیشه سبز (درخت)

**شڤک / şivik/**: ناو. تووڵ؛ تووڵ 🇮🇷 ترکه‌ی نازک

**شڤن / şivin/**: ناو. بزنەکێوی 🇮🇷 بُز کوهی

**شڤنە / şivne/**: ☜ **شپنە ـ٢**

**شڤوون / ş(i)vûn/**: ☜ **شوان**

**شفەرێ** / şiverê/: ☜ **شڤارێ**

**شڤیلە** / ş(i)vîle/: ☜ **شڤارێ**

**شقارتە** / ş(i)qarte/: ☜ **شەمچە**

**شقاق** / ş(i)qaq/: ☜ **شەقار[1]ـ١**

**شقاقی** / ş(i)qaqî/: ناو. نەخۆشی سمی ولاخەبەرزە ☲ بیماری سُم دام

**شقال** / ş(i)qal/: ناو. دارێکی دڕکاوی لە تیرەی عەناب کە تا ٣ میتر بالا دەکا، لق‌وپۆی کولکنی بۆرە کە لە پیریدا بەرەو سووری و قاوەیی دادەگەڕێ ☲ سیاه تنگرس

**شقاڵتە** / ş(i)qałte/: ☜ **شەمچە**

**شقشق** / şiqşiq/: دەنگەناو. ١. ئاوازی مەل ٢. جریوەی چێشکە ☲ ١. آوای پرندگان ٢. جیک‌جیک گنجشک

**شقڵ** / ş(i)qił/: ☜ **شەقڵ ـ١**

**شقڵە** / şiqłe/: ناوەلناو. خەستە و نەخۆش ☲ خسته و بیمار

**شقن** / şiqin/: ناو. بزنەکێوی؛ بزنەکێفی ☲ بُز کوهی

**شقووق** / şiqûq/: ناو. جۆرێ هەرمێ کێویلە ☲ نوعی گلابی وحشی

**شقین** / şiqîn/: چاوگ. گرماندنی هەور ☲ غُرّیدن رعد

**شک** / şik/: ناو. ١. دوودڵی؛ دڕدۆنگی؛ گومان ٢. ← شك بردن ☲ ١. شَک ٢. ← **شك بردن**

⊡ **شک بردن:** ١. لا هەبوون؛ پێ بوون ‹... ئەگەر هیچی شک بردایە نەیدەگوت بێ‌سەروبەرم. خودا تۆڵە دەکاتەوە مەترسە! «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. ☜ **پێ شك هاتن** ☲ ١. داشتن ٢. ☜ **پێ شك هاتن**

**شک بۆ کەسێک چوون:** لە کەسێ دڕدۆنگ بوون ☲ به کسی شک کردن

**شک کردن:** دوودڵ بوون؛ گومان کردن ☲ شک کردن

**پێ شک هاتن:** شک بردن؛ بەدی کردن؛ پێ زانین ‹... قاسم گوتوویە: دەڵێن ڕادیۆ کوردییەکەمان زۆر بێ‌تامە، کەسی وات پێ شک نایە پێی ڕابگا؟ ... «هەژار، چێشتی مجێور»› ☲ سُراغ داشتن

**کەوتنە شکەوە:** دڵ‌کرمێ بوون؛ تووشی دوودڵی و بەدگومانی بوون ☲ به شک افتادن

**شکات** / ş(i)kat/: ناو. گازندە؛ گازە؛ شکایەت: ١. داد؛ ئەوەی لەمەڕ ستەمی کەسێ یان خراپی شتێکەوە، بۆ داخواستنی ڕێگەچارە و باربوو کردنەوەی دەگوترێت ‹خەڵک لە بەرپرسان شکاتیان هەبوو› ٢. هانا؛ داخوازی ‹بۆ وەرگرتنەوەی پارەکەم شکاتم کرد› ٣. گلەیی؛ سکاڵا؛ وتەیێ کە نیشانەی دڵ ئێشان یان ناڕەزامەندییە ‹لە بارودۆخی ژیانی شکاتی هەبوو› ☲ ١تا٣. شکایت

⊡ **شکات کردن:** داخوازی دادگایی کردن هێنانە ئاراوە ☲ شکایت کردن

**شکاتی کەسێ لە کەسێ کردن:** لەمەڕ ستەمی کەسێکەوە هاوار بۆ کەسێکی تر بردن ☲ شکایت کسی را پیش کسی بُردن

**شکاتکار** / ş(i)katkar/: ناو. گازندەوان؛ دادبەر؛ دادخواز ☲ دادخواه

**شکاتکاری** / ş(i)katkarî/: ناو. دادخوازی؛ داوخوایی؛ گازندە ☲ دادخواهی

**شکاتلێکراو** / ş(i)katlêk(i)raw/: ناو. پاشمار؛ پەسمار ☲ مُتشاکی

**شکاتنامە** / ş(i)katname/: ناو. سکاڵانامە؛ دادخوازنامە؛ عەریزە؛ عەرز و حاڵ ☲ شکایت‌نامە

**شکات‌وشکاتکاری** / ş(i)kat û ş(i)katkarî/: ناو. کار و ڕەوتی شکات کردن و بەر شکات کەوتن ☲ عمل و فرایند شکایت کردن و مورد شکایت واقع

شدن

**شکار / ş(i)kar/**: ناو. ١. ڕاو؛ نچیر ٢. کەڵەکە بەرد ٣. بەردەڵان ☰ ١. شکار ٢. تودەی سنگ ٣. زمین سنگلاخ

**شکارتە / ş(i)karte/**: ناو. شناو؛ کاری چاندن بۆ هەژاران بە خێر ☰ زرع و کشت مجانی برای فقرا

**شکارتەکێڵ / ş(i)kartekêł/**: ناو. زەوی کە بە شکارتە داچێنراوە ☰ زمین کشت شده برای فقرا

**شکارگە / ş(i)karge/**: ناو. جێی‌ڕاو؛ ڕاوگە ☰ شکارگاه

**شکافتن / ş(i)kaftin/**: چاوگ. ١. درز بردن ٢. درز تێ خستن ☰ ١و٢. شکافتن

**شکافە / ş(i)kafe/**: ناو. دەنووکە؛ پێژەن؛ زەخمە؛ میزراب ☰ مضراب

**شکان / ş(i)kan/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //شکای؛ دەشکێی؛ بشکێ// شکیان: ١. ورد بوون؛ لەت بوون ‹دەڵێن شکانی ئاوێنە بەدودمە› ٢. *[مەجاز]* دۆڕاندن؛ ڕاکردن لە شەڕ ‹دوای شەڕێکی قورس، دژمن شکا› ٣. *[مەجاز]* هەڵوەشانی ڕۆژوو و دەسنوێژ ‹خەوی لێ کەوت و دەسنوێژەکەی شکا!› ٤. *[مەجاز]* هاتنە خواری نرخ ‹نرخی زێڕ شکا› ٥. *[مەجاز]* لە قەدر و حورمەت کەوتن ‹دوای ئەو قسانە، لە بەرچاوی خەڵک شکا› ٦. *[مەجاز]* داشکان؛ تێشکان؛ ژاکان؛ لە دەست دانی گەشە و لەش‌ساغی ‹دوای مردنی براکەت، باوکت زۆر شکا› ☰ ١. شکستن ٢. شکست خوردن ٣. باطل شدن (روزه و وضو) ۴. پایین آمدن قیمت ۵. از قدر و منزلت کاسته شدن ۶ شکسته شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: شکاو/ چاوگی نەرێنی: نەشکان

**شکاندن / ş(i)kandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //شکاندت؛ دەشکێنی؛ بشکێنە// شکان؛ شکەستن؛ شکەناندن؛ شکیناندن؛ شکێناندن: ١. ورد و لەت کردن ‹قۆرییەکەی شکاند› ٢. *[مەجاز]* ڕاو نانی دوژمن ‹نەترساین و دوژمنمان شکاند› ٣. *[مەجاز]* هەڵوەشاندنی ڕۆژوو و دەسنوێژ ‹گوتیان جێژنە و ڕۆژوویان شکاند› ٤. *[مەجاز]* هەرزان کردنی نرخ ‹نرخی نەوتیان شکاند› ٥. *[مەجاز]* ژێر پا نان و لە حورمەت خستن ‹کاریان، پێش هەموو شتێ، شکاندنی نەیارانیانە› ☰ ١. شکستن ٢. شکست دادن دشمن ٣. باطل کردن روزه و وضو ۴. پایین آوردن نرخ ۵. آبرو بُردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەشکاندن

**شکاندنەوە / ş(i)kand(i)newe/**: چاوگ. تێپەڕ. //شکاندتەوە؛ دەشکێنیەوە؛ بشکێنەوە// شکاننەوە: ١. لکەدار داشکاندن ‹لقێکی شکاندەوە› ٢. گەڵا لێ کردنەوەی تووتن ٣. *[مەجاز]* مناڵ فێرە کارکردن ٤. *[مەجاز]* خەجاڵەت کردن ٥. چای لە چادان تێکردن و دە چادان کردنەوە ‹چاییەکەم ئێستا شکاندەوە، جارێ ڕەنگی بەرنەداوە› ٦. بنکۆڵ کردن و گڵ وە سەر لاسک دانی شیناوەرد ٧. دووبارە شکاندن ‹تازە لە سەر ئوسا بوو، دیسان شکاندییەوە!› ٨. گەڕاندنەوەی کەروێشک لە غاردا ٩. داشکان؛ گۆڕانی ڕێگەی تێپەڕین لە ئاقارێکەوە بۆ ئاقارێکی‌تر (دەنگ، تیشک و...) ☰ ١. شاخه از درخت شکستن ٢. برگ از توتون چیدن ٣. کار به بچه یاد دادن ۴. شرمنده کردن ۵. چای ریختن و دوباره در قوری کردن ۶ خوابانیدن ساقەی بوتەهای پالیزی در خاک ٧. دوباره شکستن ٨ برگرداندن خرگوش در مسیر ٩. تغییر مسیر دادن (نور، صدا و ...)

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەشکاندنەوە

**شکانن / ş(i)kanin/**: ☜ شکاندن

**شکاننەوە / ş(i)kannewe/**: ☜ شکاندنەوە

**شکانەوە / ş(i)kanewe/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //شکایەوە؛ دەشکێیەوە؛ بشکێوە// شکیانەوە: ١. داهاتنی لک

۲. لــێ‌کردنـــەوەی گـــەڵا تـــووتن ۳. *[مـەجاز]* خەجاڵـەت بـوون ٤. *[مـەجاز]* کـەم کـردن ⊠ ۱. خمیدن شاخه رو به زمین ۲. چیـدن بـرگ توتـون ۳. خجل شدن ۴. کاستن

■ ئاوەڵناوی بـەرکاری: شـکاوەوە/ چـاوگی نـەرێنی: نەشکانەوە

**شکاو** / ş(i)kaw/: ئاوەڵـناو. شکەسـتی؛ شـکیاگ؛ شکیاو: ۱. لەت‌بوو ۲. تێکشکاو ۳. هەرزان‌بـوو ⊠ ۱. شکسته ۲. شکست خورده ۳. ارزان شده

**شـکاوای** / ş(i)kaway/: چـاوگ. هەڵکۆڵـــین ⊠ شکافتن

**شکاوی** / ş(i)kawî/: ناو. کەلی ⊠ شکستگی

**شکایەت** / ş(i)kayet/: ☜ **شکات**

**شکر** / şikr/: ☜ **شوکر**

**شکس** / ş(i)kis/: ☜ **شکست**

**شکست** / ş(i)kist/: نـاو. شکس؛ شکەس؛ شکەست: ۱. شکاوی؛ شەکاوی؛ شکیاگی ‹بێزام و شکسـت و بـێ برینـە/ ئـەو ژانـە ئەوینـە، زۆر بەتینـە «هـەژار، مەموزین»› ۲. دۆخـی بـە ئاکـام نەگەیشـتن لـە بەرێوە بردنی کارێک یان گەیشتن بە ئاواتێک ۳. نوشست؛ کار و ڕەوتی دانان؛ تێ‌شکان؛ دۆڕاندنی ململانێ یان شەڕ ⊠ ۱. شکستگی ۲و۳. شکست

⊡ **شکست خواردن**: شکســـت هێنــان؛ بــەزین ⊠ شکست خوردن

**شکست دان**: بەزاندن ‹خەزانی هیجری تۆ بوو، ئەی ئەساسی عیزز و تەمکینم/ شکستی دا بـە باغـاتی، خەیالی قـەلبی غـەمگینم «نـاری»› ⊠ شکسـت دادن

**شکست هێنان**: ☜ **شکست خواردن**

**شکستۆک** / ş(i)kistok/: ئاوەڵـناو. لە شـکان نزیـک؛ تایبەتمەندی کەل‌وپـەلێ کـە ئەگـەری شـکانی هەیە ⊠ شکستنی

**شکستە**[1] / ş(i)kiste/: ناو. ۱. خەتێکی فارسـی کـە لە دەسنووس، بەتایبەت لە نامە نووووسیندا بە کار دێ ۲. تــاق؛ خەرپشـــتەی خـــانوو ۳. شکســـە؛ شکاوی ئێسک ⊠ ۱. خط شکسته ۲. طاق گنبدی ۳. شکستگی استخوان

**شکستە**[2]: ئاوەڵناو. تێکشکاو؛ بەزیو ⊠ شکست‌خورده

**شکســـتەبەن** / ş(i)kisteben/: نـــاو. شکســـــەبەن؛ شکستەبەند؛ ئێسک‌گرەوە؛ جـەڕاح؛ کەسـێ کـە ئێســکی شــکاو یــان جومگــەی لــە جــێ چــوو دەگرێتەوە ⊠ شکسته‌بند

**شکستەبەند** / şikistebend/: ☜ **شکستەبەن**

**شکســتەبــەنــدی** / şikistebendî/: نــاو. کەلـــدان؛ جەڕاحی ⊠ شکسته‌بندی استخوان

**شکستی** / ş(i)kistî/: ناو. کەمی ⊠ کاستی

**شـکس‌گەن** / şikisgen/: ئاوەڵـــناو. وەرشکســـــتە؛ تێشکاو ⊠ ورشکست

**شکسە** / şikse/: ☜ **شکستە**[1]**-۳**

**شکسەبەن** / şikseben/: ☜ **شکستەبەن**

**شکل** / ş(i)kil/: ☜ **شکڵ**

**شکل‌کێش** / ş(i)kilkêş/: ☜ **شکڵ‌کێش**

**شکلنوس** / ş(i)kilnûs/: نـاو. ڕوونووسی؛ کـاری لـە بەر نووسینەوە ⊠ رونویسی

**شکڵ** / ş(i)kił, şikł/: نـاو. شکل: ۱. بیچم؛ بەچک؛ تەرح؛ سیما ۲. وێنە؛ ڕەسم ⊠ ۱. قیافه ۲. تصویر

⊡ **شکڵ پێ دان**: شێوە پێ دان؛ بە شێوەی دڵخواز دەرهێنان ⊠ شکل دادن

**شکڵ کێشان**: وێنە کێشان ⊠ شکل کشیدن

**شــکڵ‌کێش** / ş(i)kiłkêş/: نـــاو. شـــــکل‌کـــــێش؛ وێنەکێش؛ وێنەگر ⊠ عکاس

**شکنا** / şikna/: ناو. مەبەست؛ دۆز ⊠ مقصود؛ مرام

**شکولک** / ş(i)kulik/: نـاو. تیخوڵ؛ توێکڵ؛ تۆکڵ ⊠ پوسته

**شکۆ** / ş(i)ko/: ناو. تەنتەنـە؛ سەنسـەنە؛ سـەنتەنە؛ دەبدەبە؛ تەمتەراق؛ هەنگ‌وونگ؛ جـەلال و شـکۆ؛

برمەبرم؛ جوانی و ڕازاوەیی بەرچاوگر کە بینەر دەخاتە ڕەوش و سەرسامییەوە ‹شکۆی دلڕفێنی بەرەبەیانی بەهاران› 🇮🇷 شکوه

**شکۆدار** / ş(i)kodar/: ☜ **باشکۆ**

**شکۆفا** / ş(i)kofa/: ئاوەڵناو. بە تایبەتمەندی شکۆفانەوە و پشکووتنەوە 🇮🇷 شکوفا

**شکۆفانەوە** / ş(i)kofanewe/: چاوگ. شکۆفیانەوە: ١. پشکووتن؛ کرانەوەی گوڵ ٢. گوڵ دەرکردنی دار ٣. هەڵتۆقین و بلۆق کردنی شتێ (وەک: ئاهەک وەختێ ئاوی بە سەردا دەکەن) ٤. گەشانەوە؛ گەشە کردن 🇮🇷 ١. شکوفه زدن ٢. جوانه زدن ٣. شکُفتن ۴. رُشد کردن

**شکۆفە** / ş(i)kofe/: ناو. شگۆفە؛ کولووک؛ کلووک؛ گولووک؛ گولیک: ١. گۆچک؛ خونچە؛ گۆپکە؛ گوڵدەم؛ پێژەک؛ وڵ؛ چەم؛ گوڵێ کە هێشتا نەپشکووتووە ‹شکۆفەی نێرگس› ٢. گوڵ؛ چرۆ؛ چرەوە؛ بشکوژ؛ پشکۆژ؛ پشکوژ؛ پژکووژ؛ بشکۆش؛ پشک؛ پژک؛ شیڤ؛ هەڕاڵە؛ فنچقە؛ باتینک؛ جۆش؛ گوڵی دار ‹لەرزەی سەد تەرزەی سەوزەی دیاران/ خەندەی شکۆفەی نەمامان داران «مەولەوی»› 🇮🇷 ١و٢. شکوفه

▣ **شکۆفە کردن**: شکۆفیانەوە؛ پشکووتن 🇮🇷 شکفتن

**شکۆفیانەوە** / ş(i)kofyanewe/: ☜ **شکۆفانەوە**

**شکۆکە** / ş(i)koke/: ناو. کرۆسک؛ هەرمێ کێویلە 🇮🇷 گلابی جنگلی

**شکۆمەن** / ş(i)komen/: ئاوەڵناو. خاوەنشکۆ 🇮🇷 شکوهمند

**شکووک** / ş(i)kûk/: ناو. جۆرێ هەمرۆ 🇮🇷 نوعی گلابی

**شکە** / ş(i)ke/: ناو. بەچکە بەرازی دوو ساڵە 🇮🇷 بچه خوک دو ساله

**شکەبەر** / ş(i)keber/: ناو. ئیشکەبەرد؛ ئیشکە کەڵەک 🇮🇷 بنا از سنگ بدون ملات

**شکەس** / ş(i)kes/: ☜ **شکست**

**شکەست** / ş(i)kest/: ☜ **شکست**

**شکەستن** / ş(i)kestin/: ☜ **شکاندن**

**شکەستی** / ş(i)kestî/: ☜ **شکاو**

**شکەفت** / ş(i)keft/: ☜ **ئەشکەوت**

**شکەڤ** / ş(i)kev/: ناو. ١. تەبەق؛ سینی لە دار ٢. تەنەکە 🇮🇷 ١. طبق چوبین ٢. پیت

**شکەڤا**[1] / ş(i)keva/: ناو. نانی تیری و ناسک 🇮🇷 نان لواش

**شکەڤا**[2]: ئاوەڵناو. تورت و ناسک 🇮🇷 تُرد و نازک

**شکەڤک** / ş(i)kevik/: ناو. ١. بایەی دارین ٢. تەشتی دارین 🇮🇷 ١. کاسەی چوبین ٢. تشت چوبین

**شکەلک** / ş(i)kelik/: ناو. لەتەسواڵەت 🇮🇷 پاره سُفال

**شکەناندن** / ş(i)kenandin/: ☜ **شکاندن**

**شکەنجە** / ş(i)kence/: ناو. ئەشکەنجە 🇮🇷 شکنجه

**شکەو** / ş(i)kew/: ☜ **ئەشکەو**

**شکەوڵەت** / ş(i)kewlet/: ☜ **ئەشکەوڵەت**

**شکیاگ** / şikyag/: ☜ **شکاو**

**شکیاگی** / şikyagî/: ☜ **شکست ـ١**

**شکیان** / şikyan/: ☜ **شکان**

**شکیانەوە** / şikyanewe/: ☜ **شکانەوە**

**شکیاو** / şikyaw/: ☜ **شکاو**

**شکیناندن** / ş(i)kînandin/: ☜ **شکاندن**

**شکێڕ** / ş(i)kêř/: ناو. ١. کەڵێنەبەردی فرەوان لە کێو ‹بە شاخ و شکێڕانەوە/ بە بەندەن و لێڕانەوە «هەژار، *بۆکوردستان*»› ٢. سەری شاخ 🇮🇷 ١. شکاف بزرگ در کوه ٢. قُلەی کوه سنگی

**ـ شکێن** / ş(i)kên-/: پاشەوشە. شکێنەر ‹دڵشکێن› 🇮🇷 ـ شکن

**شکێناندن** / ş(i)kênandin/: ☜ **شکاندن**

**شگۆفە** / ş(i)gofe/: ☜ **شکۆفە**

**شل**[1] / şil/: ناو. قوڕ؛ حەڕی؛ هەڕگ 🇮🇷 گِل

**شل**[2]: ئاوەڵناو. ١. سست؛ ناپتەو ‹کەم پاڵ دەوە!

ڕەشماڵی لەشت تێک ئەتەپێ/ ئەستوندەکی کرمۆڵە، پەت و سنگی شلە «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ٢. فل؛ پلت؛ بڵ؛ وڵ؛ ڕاو؛ بەبێ پێکەوە لکاوی تەواو لە نێوان پاژەکانیدا ٣. تەوش؛ تراو ٤. گەورەتر لە ئەندازە ‹ئەم گۆرەوییە بە پام شلە› ٥. *[مەجاز]* خاو؛ کاڵ؛ خۆنەگرتوو؛ نەمەییو ٦. نەرم ‹لەشی نەرم و شل› ❋ بەرانبەر: **سفت** ≡ ١. سُست ٢. شُل ٣. آبکی ۴. گُشاد ۵. کال ۶. نرم

⊡ **شل بوون**: ١. سست بوون ٢. ماندوو بوون ٣. تەڕ بوون ٤. *[مەجاز]* نەرم بوون ‹ئەوەندە قسەیان بۆ کرد تا شل بوو› ٥. لە گرژی و توندی کەوتن ‹شل ئەبێت و بۆ چەند ساتێ وچان ئەگرێ «شێرکۆ»› ≡ ١. سُست بودن/ شدن ٢. خسته بودن/ شدن ٣. خیس بودن/ شدن ۴. نرم شدن؛ پذیرفتن ۵. آرام شدن

**شل بوونەوە**: ١. لە پێچ خاو بوونەوە ٢. لە خەستییەوە تراو بوون ٣. نەرم بوونەوە؛ لە کرژی و توندی کەوتن ‹ئەم قسانەم بیست، شل بوومەوە› ≡ ١. از تاب برگشتن ٢. شُل شدن ٣. نرم شدن

**شل کردن**: ١. تیر تراو کردن ٢. لە دوو دانی هەودا ‹گوریسی بۆ شل کە با بڕوا!› ٣. لە گوشار و زەختی (شتێ) کەم کردنەوە ‹دەست شل کە مەترسە!› ≡ ١. غلیظ را آبکی کردن ٢. شُل کردن سر ریسمان ٣. از فشار (چیزی) کاستن

**شل کردنەوە**: ١. تیر تراو کردن ٢. لە تووڕەیی خاو بوونەوە ٣. لە توندی کەم کردنەوە ‹بەنی کەوشەکەت شل کە پات نەگووشێ› ≡ ١. غلیظ را آبکی کردن ٢. آرام شدن ٣. شُل کردن

**شل گرتن**: *[مەجاز]* ١. پێ دانەگرتن ٢. بێمەیلی نیشان دان ≡ ١. سخت نگرفتن ٢. علاقه نشان ندادن

**خۆ شل کردن**: بەرهەڵستی نەکردن؛ لە بەرامبەرەوە هیچ نەکردن ‹نەختێک خۆتم بۆ شل کە/ ئەوسا تێر قسەی زل کە! «فولکلۆر»› ≡ مقاومت نکردن

**گوێ شل کردن**: *[مەجاز]* باش گوێ گرتن؛ هۆش دان ≡ خوب گوش کردن

**شل**[2]: ئاوەڵکار. ١. بە سستی؛ بە خاوی ‹شل قسەی دەکرد› ٢. نەبەگە؛ بە هێواشی ‹شل بەستن› ≡ ١و٢. شُل

**شلالە** / ş(i)lale/: ناو. تافگە؛ تاڤگە؛ تاف ≡ آبشار

**شلپین** / şilpîn/: چاوگ. ١. ڕاپەڕین ٢. هەڵاتن؛ ڕاکردن ≡ ١. برخاستن ٢. فرار کردن

**شلتاغ** / şiltağ/: ناو. چاچۆڵ؛ چاچۆڵە؛ فێڵ؛ دەبە؛ تەشقەڵە؛ گەڕ ≡ شلتاق

**شل ـ شل** / şil şil/: ئاوەڵکار. ١. نەرمە ـ نەرمە ‹شل ـ شل بمشێلە بە پەنجەکانت› ٢. زۆر و بە تاقەت ‹گرتیان و شل ـ شل کوتایان› ≡ ١. آهسته ـ آهسته ٢. درست و حسابی

**شلف** / şilf/: ناو. ١. تیژایی دەمی تیخ و نووکی ڕم ٢. شفرەی بەراز ≡ ١. لبەی تیز تیغ و سرنیزه ٢. نیش برجستەی گُراز

**شلقانن** / şilqanin/: ☜ **شڵەقاندن**

**شلک**[1] / şilk/: ناو. بان مەڵاشوو؛ پێشەسەر ≡ آهیانە

**شلک**[2]: ئاوەڵناو. ١. ناسک و تورت ‹خەیاری شلک؛ ئەنامی شلکوتەڕ› ٢. سست و لەش گران ٣. منداڵی تازە پێ گرتوو ≡ ١. تُرد و تازه ٢. سُست و تنبل ٣. کودک نوپا

**شلکاک** / şilkak/: ☜ **شرکاک**

**شلکوت**[1] / şilkut/: ناو. ١. کاری کوتەک لێ دان ٢. کاری کوتانەوە بە سفت وسۆڵی ≡ ١. کتک کاری ٢. عمل مُحکم کوبیدن

⊡ **شلکوتی مەرگ**: دارکاری زۆر سەخت ≡ کتک کاری مُفصل

⊡ **شلکوت کردن**: شل ـ شل کوتانەوە ≡ درست و

حسابی کوبیدن

**شلکوت**[٢]: ☜ **شل‌وکوت**

**شلکه**[١] / şilke/: ناو. ١. گۆشتی نەرمی بێ‌ئێسک لە ئەندامدا ‹شلکەی ڕان؛ شلکەی گوێ› ٢. نەخۆشییەکی ئاژاڵە ☰ ١. گوشت نرم در اندام ٢. از بیماری‌های دام

**شلکه**[٢]: ئاوەڵناو. شلک؛ تازە و ناسک و تورت ☰ تُرد و تازه

**شلکەبیزا** / şilkebîza/: ناو. گیاسیریژ؛ گیایەکی بۆنخۆشی کوێستانە ☰ گیاهی است

**شلکەگوێ** / şilkeg(i)wê/: ناو. چیچیلە؛ چیچک؛ چیچکە ☰ تُکمه‌ی پستان

**شلکی** / silkî/: ناو. ١. نەرمی ٢. نانی سەر ساج ☰ ١. نرمی ٢. نوعی نان

**شلکێنە** / silkêne/: ناو. ١. ڕیتکە؛ هەویری تراو ٢. جۆرێ خۆراک ٣. جۆرێ نانی چەور ٤. جۆرێ کولێرەی بە هێلکە و زەردەچێوە ☰ ١. خمیر آبکی ٢. نوعی غذا ٣. نوعی نان روغنی ۴. نوعی نان گرده

**شلمە** / şilme/: ناو. گیایەکی زیانۆکە، لە ناو دەخڵدا دەڕوێ ☰ گیاهی موذی کە در گندمزار می‌روید

**شلنگ** / ş(i)ling/: ناو. کالیار؛ ترۆزی گەورە بۆ تۆم ☰ خیارچنبر بزرگ

**شل‌وپەتیار** / şil û petyar/: ئاوەڵناو. ١. حۆل و گێژ ٢. شێتۆکە؛ دێوانە ☰ ١. گیج‌ومنگ ٢. خُل‌وچِل

**شلوخە** / ş(i)luxe/: ناو. بەندی کاڵە؛ بەنی کاڵەپێچ ☰ بند چارُق

**شل‌وشواڵ** / şil û ş(i)wał/: ☜ **شل‌وشەوێق ـ١**

**شل‌وشۆل** / şil û şol/: ئاوەڵناو. شپرز؛ شپرزە؛ بەبێ تەکووزی لە کاردا ☰ شلخته

**شل‌وشۆڵ** / şil û şoł/: ئاوەڵناو. خۆنەگر؛ بێ‌تاقەت؛ بێ‌تابشت ‹ئیسە جە دووریت شێویان پوومەتم/ شل‌وشۆل بیەن ئەلفی قامەتم «؟»› ☰ شُل‌ووِل

**شل‌وشەوێق** / şil û şewêq/: ئاوەڵناو. ١. شلەپەتە؛ شل‌وشەوێق؛ شل‌وشێواو؛ خۆنەگرتوو ‹پیرەمێردێکی ... دەم‌وچاو چرچی لووت ئاولاوی شل‌وشەوێق، ئەوەندە قسەخۆش بوو نەبێتەوە «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. *[مەجاز]* شپرزە؛ شپرێو ٣. تەپلۆس؛ ترال؛ کارلێ‌نەهاتوو ☰ ١. شُل‌ووِل ٢. نامُرتب ٣. تنەلش

**شل‌وشێواو** / şil û şêwaw/: ☜ **شل‌وشەوێق ـ١**

**شل‌وکوت** / şil û kut/: ئاوەڵناو. شەل‌وکوت؛ شلکوت: ١. زۆر ماندوو ٢. هێز پێ‌نەماو ☰ ١. بسیار خسته ٢. بی‌رمق

**شل‌ومل** / şil û mil/: ئاوەڵناو. ١. جوانی لەش نەرم و نیان ‹شل‌ومل و لەبارن/ چاوبەکل، گوێ بەگوارن «هێمن»› ٢. نەرم و ناسک ☰ ١. زیبای نرم‌اندام ٢. نرم و لطیف

**شل‌ووڵ** / şil û wil/: ئاوەڵناو. *[بڵار]* سست و خۆنەگرتوو. هەروەها: **شل‌وولی** ☰ شُل‌ووِل

**شلوێ** / şilwê/: ئاوەڵناو. شلوو؛ شەیلە؛ شیلۆ؛ شیلی؛ شێلوو: ١. لێڵ ‹کانی ڕوونم دی بە لێشاوی بەهار شلوێ نەبوو/ بەفری گەورەم دی چیای گرت و بە تاوێ بوو قەدەم «هێمن»› ٢. *[مەجاز]* قەڵس؛ تێکچوو ‹سەد قسەی پێ بڵێی، شلوێ نابێ› ☰ ١. کِدِر ٢. مُکدر

**شلۆ** / ş(i)lo/: ناو. جۆرە کراسێکی قەدیمی ژنانە ☰ نوعی پیراهن قدیمی زنانه

**شلۆپ** / ş(i)lop/: ناو. ١. قوڕ و چڵپاو ٢. ڕیپۆقی چاو ☰ ١. گل و لای ٢. ژَفَک؛ قی چشم

**شلۆپە** / ş(i)lope/: ☜ **شلێوە**

**شلۆر** / ş(i)lor/: ناو. ١. شلنگ؛ ترۆزی زل ٢. حەمشین؛ هەڵووژە قەیسی؛ شەلیل ☰ ١. خیارچنبر بزرگ ٢. شلیل

**شلۆغ** / ş(i)loğ/: ☜ **شلۆق**

**شلۆقە / ş(i)love/:** ☜ **شلێوە**

**شلۆق / ş(i)loq/:** ئاوەڵناو. شلووق؛ شلۆغ؛ شلۆغ: ١. شپرز؛ شپرێو؛ تێکەڵ ـ پێکەڵ ٢. پەرێشان؛ بێسەروبەر ‹بە کوردی پێت بڵێم: حالەت شلۆقە/ دوای چی کەوتووی بەم گورگەلۆقە؟ «جەنابی مەلا»› ٣. سست؛ ناپتەو ٤. هاروهاج؛ نەگریس ٥. قەیراناوی ‹بارودۆخی شلۆق؛ خالی شلۆق› ٦. جەنجاڵ؛ گەوز؛ قەرەباڵغ؛ پرحەشامەت ‹جادەکە ئەوندە شلۆق بوو هاتوچوو نەدەکرا› ▬ ١. شلوغ ٢. بی‌سروسامان ٣. سُست و نامحکم ۴. شلوغ ۵. بحرانی ۶. پُرترافیک

▣ **شلۆق بوون:** ١. هاروهاج بوون ٢. پەرێشان‌حاڵ بوون ٣. شێوانی وڵات؛ پشێوە و ئاژاوە داکەوتن ▬ ١. شلوغ بودن ٢. پریشان‌حال بودن ٣. آشوب برپا شدن

**شلۆق کردن:** ١. شێواندن ٢. هاروهاجی کردن ▬ ١. آشوب برپا کردن ٢. شلوغ کردن

**شلۆقی / ş(i)loqî/:** ناو. چەقە و گورە؛ گانەگۆڵ؛ بریو ـ بریو؛ دۆخ یان چۆنیەتی شلۆق بوون ▬ شلوغی

▣ **شلۆقی کردن:** هاروهاجی کردن ▬ شلوغ کردن

**شلۆقیان / ş(i)loqyan/:** چاوگ. شلووقیان؛ بشێوە خۆش کردن؛ ئاژاوە نانەوە ▬ آشوب و بلوا برپا کردن

**شلۆملۆ / ş(i)lom(i)lo/:** ئاوەڵناو. زۆر نەرم بۆ کێڵان (زەوین) ▬ نرم برای زراعت (زمین)

**شلوو / ş(i)lû/:** ☜ **شلوێ**

**شلووق / ş(i)lûq/:** ☜ **شلۆق**

**شلووقیان / ş(i)lûqyan/:** ☜ **شلۆقیان**

**شلە[1] / ş(i)le/:** ناو. ١. شێوی تراو ٢. خۆرشتی گرار ٣. جۆرێ چیتی پشتێند ▬ ١. آش آبکی ٢. خورشت بلغور ٣. نوعی پارچه

▣ **شلە پێ دان:** [پلار] نەرمی نواندن؛ دەغەڵی کردن لە کاردا ‹لە قەستی شلەی پێدا و خۆی گێل کرد، دەرباز بێ› ▬ سهل‌انگاری کردن

**شلە[2]:** پێشوشە. ١. شل ـ ‹شلەجاو› ٢. لە پێش ناو یان ئاوەڵناوەوە دێ، وشەیەکی دیکە دروست دەکا ‹شلەشاری؛ شلەمار› ▬ ١و٢. شُل ـ

**شلەبرۆش / ş(i)leb(i)ř̂uş/:** ناو. شلەبرووش؛ گراز؛ برۆیشین؛ برێش؛ چێشتی وردە ساواری تراو ▬ آش بلغور

**شلەبرووش / ş(i)leb(i)ř̂ûş/:** ☜ **شلەبرۆش**

**شلەپ / ş(i)lep/:** ناو. لەخش؛ لەخشە؛ خلیسک؛ ڕەوتی خزان ▬ لغزش

**شلەپان / ş(i)lepan/:** ☜ **شڵەقان**

**شلەپاندن / ş(i)lepandin/:** ☜ **شڵەقاندن**

**شلەپەتە / ş(i)lepete/:** ☜ **شلوشەوێق ـ١**

**شلەپین / ş(i)lepîn/:** چاوگ. خلیسکان؛ خزیان ▬ لغزیدن

**شلەتین / ş(i)letîn/:** ☜ **شلەتێن**

**شلەتێن / ş(i)letên/:** ئاوەڵناو. شلەتین؛ شیرتین؛ شیلەوگەرم؛ نە سارد و نە داخ ▬ ولرم

**شلەجاف / ş(i)lecaf/:** ناو. گیایەکی بێ‌لاسکە سەرەتای بەهاران لە ناو باخدا دەڕوێ، گوڵی زەردۆکە و گەڵای پان دەردەکا، بنەکەی کەڵکی دەرمانی هەیە ▬ گیاهی دارویی

**شلەجاو / ş(i)lecaw/:** ناو. کاری ورد جاوینی خۆراک ▬ عمل خوب جویدن

**شلەختە / ş(i)lexte/:** ئاوەڵناو. [پلار] کار لە دەست نەهاتوو ▬ بی‌دست‌وپا

**شلەزەرد / ş(i)lezerd/:** ناو. چێشتی برنج و شەکر و زافەران ▬ شلەزرد

**شلەساوار / ş(i)lesawar/:** ناو. [پلار] چێشتەتەڕەی برۆیش ▬ آش بلغور

**شلەشاری / ş(i)leşarî/:** ناو. [پلار] شارستانی بێ‌هونەر و لەکەڵ دەرنەهاتوو ▬ شهرنشین بی‌هنر

**شلەشل** / ş(i)leşil/: ناوەڵکار. نەرمــە ـ نەرمــە؛ هێدی ـ هێدی؛ لەسەرخۆ ☰ سلانه ـ سلانه

**شلەقاورمە** / ş(i)leqawirme/: نـاو. شــێوێکه لــه گۆشت و کشمیش و قەیسی ☰ از خوراکی‌ها

**شلەک** / ş(i)lek/: ناو. ١. شێوی تـراو ٢. شـلکێنە؛ هەویری شل ☰ ١. آش آبکی ٢. خمیر آبکی

**شلەمار** / ş(i)lemar/: ناو. جۆرێ مار ☰ نوعی مار

**شلەنگ** / ş(i)leng/: ناو. شیلانگ؛ شلەنگ؛ شلنگ؛ تپێن؛ لوولەیەکی نـەرم بـۆ گواسـتنەوەی شـلە و تراو ☰ شیلنگ

**شلی** / ş(i)lî/: نـاو. شـولی: ١. سســتی ‹شـلی مەنوێنـە!› ٢. تەڕی ‹بیبـاری تـوون بـە شـلی یـان وشکی› ٣. ڕۆژانی بارانی ٤. داهێزاوی؛ داشۆڕاوی ‹شـلی پێسـت دوای منـداڵ بـوون› ☰ ١. شُـلی ٢. خیسی ٣. روزهای بارانی ۴. افتادگی؛ شُلی

**شلیت** / ş(i)lît/: ناو. شلیتک: ١. شریت ٢. تـەنافی جلکان ☰ ١. رشتەی تابیده ٢. طناب رخت

**شلیتک** / ş(i)lîtik/: ☜ **شلیت**

**شلیک** / ş(i)lîk/: نـاو. تفەزەوینــە؛ تووەفــەرەنگی؛ بنەگیایەکه بەرێک دەگرێ لە سوورەتوو دەکـا ☰ بوتەی توت فرنگی

**شلیل** / ş(i)lîl/: ☜ **شلێر-١**

**شلێر** / ş(i)lêr/: نـاو. ١. شـلیل؛ شـلێرە؛ گوڵـێکی ســــووری ئــــاڵ یــــان زەردی پیالەئاســـای سەرەونخوونە ٢. شلێل؛ دەخڵی نە گەنم نە جـۆ ☰ ١. لالەی سرنگون ٢. غلەای میان گندم و جو

**شلێرە** / ş(i)lêre/: ☜ **شلێر-١**

**شلێقان** / ş(i)lêqan/: چـاوگ. پلیخان؛ تلێقیـان ☰ له شدن

**شـلێقانن** / ş(i)lêqanin/: چــاوگ. پلــــیخاندن؛ تلێقاندنەوە ☰ له کردن

**شلێقنای** / ş(i)lêqnay/: چـاوگ. پلیشـاندن ☰ لـه کردن

**شلێقیای** / ş(i)lêqyay/: چاوگ. پلیشان ☰ له شدن

**شلێل** / ş(i)lêl/: ☜ **شلێر-٢**

**شلێم** / ş(i)lêm/: نـاو. سـەر کـڵاوەی لـه بـەن ☰ سرپوش نخی

**شڵ**/şił/: ☜ **شلە**

**شڵاپ** / ş(i)łap/: دەنـگ. شـڵـپ؛ دەنگـی ئـاو کـە شتێکی تێ دەکەوێ ☰ صدای افتادن چیزی در آب

**شڵاڵ** / ş(i)łał/: ناو. شەلاڵ؛ جـۆرێ دروومانـە کـە دەزوو لە هەر دوو دیوی دووراوەکـەوە دەردێ ☰ دوخت شلال

**شڵاڵە** / ş(i)łałe/: ناو. تابـەنی کتێـب ☰ شـیرازەی کتاب

**شڵانە** / ş(i)łane/: نـاو. شـێلانە؛ شـلانی؛ شـەلانە؛ شەلانی؛ شێلانێ؛ زەردالوو؛ قەیسی ☰ زردالو

**شڵانەکوت** / ş(i)łanekut/: ناو. نانەقەیســی؛ لەتکـە قەیسی؛ قەیسی وشک ☰ برگەی زردالو

**شڵانی** / ş(i)łanî/: ☜ **شڵانە**

**شڵپ**[١] / şiłp/: ناو. پڕی دەست (لە تراو) ‹شڵـپێ ئـاو بە دەم و چاوتدا دە!› ☰ پُر یک مُشت (مایع)

**شڵپ**[٢]: ☜ **شڵاپ**

**شڵپاو** / şiłpaw/: ناو. ١. چلپاو ٢. پێل؛ شەپۆل ☰ ١. گل و لای ٢. موج

**شڵپنای** / şiłpnay/: چـاوگ. لـە ئـاو گەوزانـدن ☰ غرقاب کردن

**شڵپوکوت** / şiłp û kut/: دەنگەناو. ١. دەنگی لە نێو ئاودا کایە و هەڵبەز ـ دابەز کردن ٢. دەنگی لێدان و دارکـاری کـردن ☰ ١. صـدای بـازی در آب ٢. صدای کتک‌کاری

**شڵپوکۆ** / şiłp û ko/: دەنگەناو. شڵپوهۆڕ؛ دەنگـی وێکەوتنی شتێ لە ئاودا ‹زیکەی مشک‌گرە، فـڕەی سەرسەوزان/ شڵپ‌وکۆی بۆرچین لە دەوری حـەوزان «قانع»› ☰ صدای برخورد با آب

**شڵپوهۆڕ** / şiłp û hoř/: ☜ **شڵپوهوڕ**

**شلپوهوڕ** / şiłp û hûř/: شلپوهۆڕ؛ دەنگی دە ئاو کەوتن و پێکدادانی شەپۆلان ‹نامانە مل چەم، سوار لە شوێن سوار/ شلپوهووڕ کەوتە ناو تەنکاوی بوار «گۆران»› ☗ صدای به هم خوردن امواج

**شلپە**[1] / şiłpe/: ناو. [کنایە] پلاوی زۆر چەور ☗ پلو بسیار چرب

**شلپە**[2]: دەنگەناو. شەپە: ١. دەنگی کەوتنە ناو ئاو ٢. دەنگی کەوتنی شتی نەرمی سەنگین بە زەویدا ☗ ١. تالاپ؛ صدای افتادن در آب ٢. صدای افتادن جسم نرم سنگین بر زمین

**شلپەشلپ** / şiłpeşiłp/: دەنگەناو. شەپەشەپ، دەنگی شلپەی زۆر و لە سەر یەک ☗ تالاپتلوپ؛ صدای پیاپی افتادن در آب

**شلپیای** / şiłp(i)yay/: چاوگ. لە ئاو گەوزان ☗ غرقاب شدن

**شلپیتاو** / şiłpîtaw/: ناو. [کنایە] ١. شۆرباوی زۆر تراو و بێڕۆن ٢. [پلار] شلپێ؛ مرۆی بێفەڕ و هیچ و پووچ ☗ ١. شوربای خیلی آبکی ٢. آدم بیخاصیت

**شلپێ** / şiłpê/: ☜ **شلپیتاو ـ٢**

**شلتاخ** / şiłtax/: ☜ **شلتاغ**

**شلتاغ** / şiłtağ/: ناو. شلتاخ؛ شلتاق؛ تەشقەلە؛ دەبە؛ گەڕ ‹بوو بە خۆشی خۆشیمان کە خوا شوکور لە چنگ ئەمنیە و شلتاغی مەئموور ڕزگار بووین «هەژار، چێشتی مجێور»›. هەروەها: **شلتاغباز** ☗ شلتاق

**شلتاق** / şiłtaq/: ☜ **شلتاغ**

**شلتان** / şiłtan/: ☜ **شەلاڵ**[2]

**شلخە** / şiłxe/: ناو. ١. ☜ **شەلغە** ٢. شخل؛ کەلەک لە سەر یەک ☗ ١. ☜ **شەلغە** ٢. بر هم انباشتگی

**شلخەمێش** / şiłxemêş/: ناو. شەلتە؛ نانک؛ گەوک ☗ نسل تازه زنبور عسل

**شلدم ـ شلدم** / şiłdim şiłdim/: دەنگەناو. دەنگی تەشک و داوێنی تەڕ ☗ صدای دامان خیس

**شلغە** / şiłğe/: ☜ **شەلغە**

**شلفت** / şiłfit/: ناوەلناو. [پلار] پنتی؛ خوێڕی و بێکارە ☗ هرزەی بیغُرضه

**شلق** / şiłq/: دەنگ. دەنگی تراو کاتی ڕژان یا شت تێ کەوتن ☗ صدای مایعات

**شلقان** / şiłqan/: ☜ **شلەقان**

**شلقاندن** / şiłqandin/: ☜ **شلەقاندن**

**شلقاو** / şiłqaw/: ☜ **شلەقاو**

**شلقە** / şiłqe/: دەنگەناو. دەنگی ڕاژانی تراو لە دەفردا ‹کوان شەنگەبێری لە چیا و کوێستانان/ شلقەی مەشکەیان بەری بەیانان «سەیفولقوزات»› ☗ صدای بر هم خوردن مایع در ظرف

**شلقەشلق** / şiłqeşiłq/: دەنگەناو. شلقەی زۆر ☗ صدای بر هم خوردن پیاپی مایع در ظرف

**شلقیاگ** / şiłq(i)yag/: ☜ **شلەقاو**

**شلنگ** / ş(i)łing/: ناو. ١. شنگڵ؛ شنگڵ؛ شەنگڵ؛ کاری تەکان بە خۆ دان؛ ڕاپەڕین لە کار ٢. ☜ شلەنگ ☗ ١. عمل تکانی بە خود دادن ٢. ☜ شلەنگ

**شلنگە** / şiłinge/: ☜ **شەنگڵ ـ١**

**شلۆغ** / ş(i)łoğ/: ☜ **شلۆق**

**شلۆڤە** / ş(i)łove/: ☜ **شلێوە**

**شلە** / ş(i)łe/: ناوەلناو. شل: ١. سوورکاڵی پنۆک ـ پنۆک سپی ‹ژنێکی شلەی کەژ، کە چاوی لەبەر تاو هەلنایە؛ قاچ باریک، لاواز، دەتگوت داردۆژەنگە، هات و دەستی دە دەستی نایێن! «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. بەلەکی سوور و سپی ‹دەموچاوی شلە› ☗ ١. قرمز روشن با خالهای سفید ٢. ابلق سُرخ و سفید

**شلەپنای** / ş(i)łepnay/: چاوگ. ژەنین؛ شلەپەتنای؛ شلپە لێ هەلساندن ☗ مایعی را بە

هم زدن

**شلەپەتنای** / ş(i)łepetnay/: ☜ **شلەپنای**

**شلەپەتیای** / ş(i)łepetyay/: ☜ **شلەپیای**

**شلەپیای** / ş(i)łepyay/: چاوگ. ژەنران؛ شلەپیای؛ شلپە لێ هەڵسان ☰ به هم خوردن مایع

**شلەژان** / ş(i)łejan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //شلەژای؛ دەشلەژێی؛ بشلەژێ// ژڵەژان؛ شلەژین؛ شلێژان؛ شلێوان؛ شلێویای؛ ژلێژیای؛ شلێژیای: ١. پەشۆکان؛ شلەژان ‹دایکم شلەژابوو، گوتی خەونێکی زۆر ناخۆشم دیوە› ٢. شێوان؛ تێکەڵ-پێکەڵ بوون ‹شار شلەژاوە› ☰ ١. آشُفتن ٢. درهم ریختن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: شلەژاو/ چاوگی نەرێنی: نەشلەژان

**شلەژاندن** / ş(i)łejandin/: چاوگ. تێپەڕ. //شلەژاندت؛ دەشلەژێنی؛ بشلەژێنە// ژڵێوانن؛ شلێواندن؛ شلێونای؛ ڕاتلەکاندن؛ ژلێژنای؛ شلێژنای؛ ڕاتلەقاندن ☰ (به) هم زدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەشلەژاندن

**شلەژاو** / ş(i)łejaw/: ئاوەڵناو. شلەژیو: ١. پەشۆکاو؛ شلەژاو ٢. ڕەنگ پێ نەماو (لە ترسان یان لە خەبەری ناخوش) ٣. تێکەڵ ـ پێکەڵ؛ شێواو ‹بازاڕی شلەژاو› ❋ هەروەها: **شلەژاوی** ☰ ١. آشُفته ٢. رنگ باخته (از ترس یا خبر بد) ٣. درهم‌برهم

**شلەژە** / ş(i)łeje/: ناو. ١. پەشۆکاوی ٢. لێکدراوی و تێکەڵ-پێکەڵی ☰ ١. آشفتگی ٢. درهم ـ برهمی

**شلەژین** / ş(i)łejîn/: ☜ **شلەژان**

**شلەژیو** / ş(i)łejîw/: ☜ **شلەژاو**

**شلەقان** / ş(i)łeqan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //شلەقای؛ دەشلەقێی؛ بشلەقێ// شلقان؛ شلەقیان؛ شلەقین؛ شلەپان؛ شەقران؛ ڤژان؛ شلەقەتیای؛ شلەقیای؛ ڕاژانی تراو لە دەفردا ☰ به هم خوردن مایع در ظرف

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: شلەقاو/ چاوگی نەرێنی: نەشلەقان

**شلەقاندن** / ş(i)łeqandin/: چاوگ. تێپەڕ. //شلەقاندت؛ دەشلەقێنی؛ بشلەقێنە// شلقاندن؛ شلەقانن؛ شلەپاندن؛ شلقانن؛ شەقراندن؛ شلەقەتنای؛ شلەقنای؛ شلێژان؛ زلقنای؛ زلەقەتنای؛ ڕاژاندنی تراو لە دەفردا ‹پێش خواردن بیشلەقێنە!› ☰ هم زدن؛ به هم زدن مایع در ظرف

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەشلەقاندن

**شلەقانن** / ş(i)łeqanin/: ☜ **شلەقاندن**

**شلەقاو** / ş(i)łeqaw/: ئاوەڵناو. شلقاو؛ شلقیاگ؛ شلەقیاگ؛ لە دەفردا هەژێندراو ‹ماستاوی شلەقاو› ☰ به هم زده شده در ظرف

**شلەقنای** / ş(i)łeqnay/: ☜ **شلەقاندن**

**شلەقەتنای** / ş(i)łeqetnay/: ☜ **شلەقاندن**

**شلەقەتیای** / ş(i)łeqetyay/: ☜ **شلەقان**

**شلەقیاگ** / ş(i)łeqyag/: ☜ **شلەقاو**

**شلەقیان** / ş(i)łeqyan/: ☜ **شلەقان**

**شلەقیای** / ş(i)łeqyay/: ☜ **شلەقان**

**شلەقین** / ş(i)łeqîn/: ☜ **شلەقان**

. **شلەقێن** / ş(i)łeqên/: پاشوشە. ١. تراو لە دەفردا بزوێن ‹مەشکەشلەقێن› ٢. *[کینایە]* تێکەوەدەر و بشێوێن ‹بازاڕشلەقێن› ☰ ١. تکان دهندەی مایع در ظرف ٢. برهم‌زننده

**شلەکە** / ş(i)łeke/: ناو. مراوی ڕەشکە؛ مراوی ڕەشە؛ مراوی خڕە ☰ اُردک چشم طلایی

**شلەنگ** / ş(i)łeng/: ☜ **شلەنگ**

**شلێژان** / ş(i)łîjan/: ☜ **شلەژان**

**شلێژنای** / ş(i)łêjnay/: ☜ **شلەژاندن**

**شلێژیای** / ş(i)łêjyay/: ☜ **شلەژان**

**شلێقانن** / ş(i)łêqanin/: چاوگ. پلیخاندن؛ پان کردنەوە ☰ له کردن

**شلێقیاگ** / ş(i)łêqyag/: ئاوەڵناو. پلیخاوە ☰ لەشده

**شلێقیان / ş(i)łêqyan/**: چاوگ. پلیخانەوە ☰ لە شدن

**شلێوان / ş(i)łêwan/**: ☜ شلەژان

**شلێواندن / ş(i)łêwandin/**: ☜ شلەژاندن

**شلێونای / ş(i)łêwnay/**: ☜ شلەژاندن

**شلێوە / ş(i)łêwe/**: ناو. شلۆپە؛ شلۆقە؛ شلۆقە؛ شولۆپە؛ دوودانگ؛ بارینی بەفر و باران پێکەوە ☰ بارش برف و باران با هم

**شلێویان / ş(i)łêwyan/**: چاوگ. پشێوی و ئاژاوە کەوتنەوە ☰ آشفتە شدن

**شلێویای / ş(i)łêwyay/**: ☜ شلەژان

**شم / şim/**: ناو. فنگ؛ فم؛ فن؛ دەنگی لووت لە کاتی سڕیندا ☰ فین

**شما / ş(i)ma/**: ناو. مۆم؛ شەم ☰ شمع

**شمادان / ş(i)madan/**: ناو. مۆمدان ☰ شمعدان

**شمار / ş(i)mar/**: ناو. ژمار؛ ئەژمار ☰ شُمار

**شماردن / ş(i)mardin/**: چاوگ. ژماردن؛ بژاردن ☰ شُمُردن

**شمارۆن / ş(i)maron/**: ناو. مێوەڕۆن ☰ مخلوط موم و روغن

**شمارە / ş(i)mare/**: ناو. ژمارە؛ بژارە ☰ شُمارە

**شمارەکوت / ş(i)marekut/**: ☜ ژمارەکوت

**شمال / ş(i)mal/**: ئاوەڵناو. جوانچاک و ئاکارپەسەند ☰ خوش‌قیافە و خوش‌اخلاق

**شمام / ş(i)mam/**: ☜ شەمامە

**شمامۆک / ş(i)mamok/**: ☜ شەمامە

**شمتن / şimtin/**: ☜ شوتی

**شمتو / şimtû/**: ☜ شوتی

**شمتی / şimtî/**: ☜ شوتی

**شمتی‌تاڵک / şimtîtałk/**: ☜ کاڵەکەمارانە ـ١

**شمتین / şimtîn/**: چاوگ. هەڵخلیسکان؛ خزیان ☰ لغزیدن

**شمخاڵ / şimxał/**: ناو. قرمە؛ تفەنگی شینکی ☰ تُفنگ سرپُر

**شمراخ / şimrax/**: ئاوەڵناو. شناخ؛ شەناخ؛ لک و پۆپ براو؛ یەختەکراو (دار) ☰ کاملاً هرس شدە (درخت)

**شمستی / ş(i)mistî/**: ☜ شوتی

**شمش / şimş/**: ناو. ١. جەرگی سپی؛ سیپەلاک ٢. سپڵ؛ ئەسپوول؛ سوویە ٣. کەستەک؛ شیش؛ شڤش؛ لۆک؛ لۆکم؛ تۆلا؛ قورسە؛ قوڵت؛ کوماچە؛ کانزای پاڵێوراو کە بۆ گواستنەوە یان فرۆش، لە ڕێژە و ئەندازەی ڕەچاوکراودا دایدەڕێژن ☰ ١. ریە؛ شُش ٢. طحال ٣. شمش

**شمشات / şimşat/**: ئاوەڵناو. مشت‌وماڵ‌دراو ☰ صاف و صیقلی

**شمشاد / şimşad/**: ناو. شمشار؛ شمشارە؛ شمشاڵ؛ شەمشا؛ درەختێکی هەمیشە سەوزی ڕازێنەیی، بە گەڵای سەوزی تۆخ و بریقەدار، چێوی سفت و پتەو کە لە هەشت میتر بەرزتر نابێ و لە پیشەسازیدا بە کار دێ ☰ شمشاد

**شمشار / şimşar/**: ☜ شمشاد

**شمشارە / şimşare/**: ناو. *[کۆن]* ١. تاو؛ هەتاو ٢. قەلا یان جێگەی خودای هەتاو ٣. ☜ شمشاد ☰ ١. آفتاب ٢. قلعە یا جایگاه الهەی آفتاب ٣. ☜ شمشاد

**شمشاڵ / şimşał/**: ناو. ١. شەباب؛ شەبابە؛ بلوێری کانزا، لە سازە زۆر کۆنەکانی کورد ٢. ☜ شمشاد ☰ ١. نی فلزی ٢. ☜ شمشاد

**شمشاڵژەن / şimşałjen/**: ناو. دوودک‌بێژ؛ ژەنیاری شمشاڵ ☰ نوازندەی نی فلزی

**شمشمک / şimş(i)mik/**: ناو. ١. سەرپایی؛ شمک؛ پاپووچە؛ سووکەپێلاو ٢. تەق‌تەقیلە؛ تەقتەقی ☰ ١. دمپایی ٢. کفش بچەگانە

**شمشە / şimşe/**: ناو. ١. دار یان کانزای ڕاستەی بەنایی ٢. کاری ماڵە کێشانی سواغ ☰ ١.

شمشەی بنایی ٢. مالەکشی

▣ **شمشە کێشان**: ماڵە کێشانی دیوار بە شمشـە 🇮🇷 ماله کشیدن دیوار با شمشه‌ی بنایی

**شمشەکاری** / şimşekarî/: ناو. کاری ماڵە کێشـانی سواغ 🇮🇷 مالەکشی

**شمشیر** / şimşîr/: ☜ **شیر-٢**

**شمشیلە** / şimşîle/: ☜ **شمشێرە**

**شمشێر** / şimşêr/: ☜ **شیر-٢**

**شمشـێربال** / şimşêrbał/: نـاو. چەورووکـەـ؛ کاردەپەلە 🇮🇷 پرستوی بادخورک

**شمشێرد** / şimşêrd/: ☜ **شیر-٢**

**شمشێرماسی** / şimşêrmasî/: ☜ **شیرماسی**

**شمشێرە** / şimşêre/: نـاو. شمشـیلە: ١. کلیلـی گۆڵە؛ پارچەیێ لە گۆڵەی دەرگـادا ٢. ئامرازێکـە لە ئێرەقەی هەوجاڕدا 🇮🇷 ١. کلیـد کلـون چـوبی ٢. ابزاری در خیش

**شمشێری**[١] / şimşêrî/: ناو. ١. جۆرێک برینجی باش و بۆنخـۆش ٢. جۆرێـک قۆڵـی کراسـی ژنانـە ‹کراسەکەم با قۆڵەکەی شمشێری بێ› 🇮🇷 ١. نـوعی برنج مرغوب ٢. آستین شمشیری

**شمشێری**[٢]: ئاوەڵناو. ١. سـەر بـە شمشـێر ‹پۆڵای شمشێری› ٢. وەک شمشێر ‹قۆڵی شمشێری› 🇮🇷 ١و٢. شمشیری

**شمقاڕ** / şimqař/: ناو. خێزانە باڵندەیەکی ڕاوکەرن لە تۆرەمەی هەڵۆ، نزیک ٥٠ سانتی‌میتـر دەبـن، لەشیان باریک و باڵیان درێـژ و کـەمێک کـوورە، نەویفڕن و سەری باڵیان کەمێک قیت ڕادەگرن، لە سـەر زەوی یـان لـە نـاو قامیشـەڵان هێلانـە دەکـەن، چـەن جۆریـان هەیـە: شمقـاڕی بـۆر، شمقـاڕی زەلان، شمقـاڕی گـەنمان، شمقـاڕی سپی ‹چەندە ڕاوی کـەو و کـەوبارم کـرد/ دوژمـنی تاقمی شمقاڕم کرد «سوارە»›. هـەروەها: **شمقـاڕی بۆر؛ شمقاڕی زەلان؛ شمقاڕی گەنمان؛ شمقاڕی سپی** 🇮🇷 سُنقُر

**شمک** / ş(i)mik/: ناو. سۆل؛ سـەرپایی؛ سووکەپێلاو 🇮🇷 دمپایی

**شملی** / şimlî/: نـاو. ١. کاخلـی؛ قاقلـی؛ گیایەکـە لاسک سـپی، دەسـچێن، گوڵـێکی زەردی وەک زافەران دەکا بە کولێرەیەوە دەکەن ٢. گیایـەکی شـینە، لـە وێنجـە دەکـا و لـە سـەوزیجاتە ٣. شنگڵەبەرەکەتە؛ دوو یا چەندلکی پێکەوە نووساو لە تەڕەکاڵدا ٤. قوماشێکە 🇮🇷 ١. کاجیره ٢. شنبلیله ٣. جُفتی؛ دو یا چند ساقه‌ی به هم چسبیده ۴. نـوعی پارچه

▣ **شملی شەڕ**[بلار] پێوقەدەم شووم؛ هۆی شەڕ و نەگبەتی؛ ئەوەی خراپەی بە شوێنەوە بـێ ‹لـە قەستی شلەی پێدا و خۆی گێل کرد، دەرباز بـێ› 🇮🇷 بدقدم

**شـملیبراکە** / şimlîb(i)rake/: نـاو. شەنگڵـەـ؛ شملـیبەرەکـەت؛ شملـیبەرەکەتـەـ؛ شـەنگلەبەرەکەتە؛ شنگڵـەـبەرەکەتە؛ شەنگڵـەبەرەکەت؛ شەنگڵـەبەرەکەتە؛ شـەنگۆڵ؛ شەنگەبەرە؛ دوانی پێکەوە نووساو 🇮🇷 جُفت به هـم چسبیده

**شملیبەرەکەت** / şimlîbereket/: ☜ **شملیبراکە**

**شملیبەرەکەتە** / şimlîberekete/: ☜ **شملیبراکە**

**شملیە** / ş(i)miłye/: ☜ **شەمبلیلك**

**شمۆرتک** / ş(i)mortik/: ئاوەڵکار. کەمووسکەیەک؛ پاژێکی کەم 🇮🇷 کمی؛ جُزئی از کُل

**شمۆرکە** / ş(i)morke/: نـاو. دەموفلچ؛ لچ و لێـو 🇮🇷 لب و لوچه

**شموز** / ş(i)mûz/: ☜ **شەمبوز**

**شمە** / ş(i)me/: جێناو. ئێوە؛ هوون؛ ئـەنگۆ؛ هنـگ؛ هەوە 🇮🇷 شُما

**شمەک** / ş(i)mek/: ناو. شـتمەک؛ شـتومـەک 🇮🇷 رخت و اثاث

**شمی** / ş(i)mî/: ناو. تووو؛ تفی؛ تی؛ دار تووو و بەرەکەی ☰ توت

**ـ شمێر** / ş(i)mêr-/: پاشەوشە. ـ ژمار؛ ـ ژمێر ☰ ـ شُمار

**شن**[1] / şin/: ناو. ١. تاسە؛ ئارەزوو ٢. دارێکی لێرەوار، گەڵاکانی ورد و خشتن ☰ ١. اشتیاق ٢. درختی جنگلی

**شن**[2]: دەنگ. خن؛ دەنگی هەناسەدانی ماندوو ☰ هن؛ صدای نفس خسته

**شناخ** / ş(i)nax/: ☜ **شمراخ**

**شناس**[1] / ş(i)nas/: ناو. شوناس؛ ئاشنا؛ ناسیاو ‹لەوێ شناسێکم هەیە› ☰ آشنا

**شناس**[2]: ئاوەڵناو. شوناس؛ ئاشنا؛ ناسیاو ‹کابرایەکی شناسم پێگەیشت› ☰ آشنا

**شناسایی** / ş(i)nasayî/: ناو. شوناسایی؛ ئاشنایی؛ ڕەوتی ناسین. هەروەها: **شناسایی کردن** ☰ شناسایی

**شناسنامە** / ş(i)nasname/: ناو. ناسنامە؛ پێناسە؛ پێناس ☰ شناسنامە

**شناسی** / ş(i)nasî/: ناو. شوناسی؛ ئاشنایی؛ ئاشنایەتی ☰ آشنایی

**شناسیار** / ş(i)nasyar/: ناو. ئاشنا؛ شناس ☰ آشنا

**شناسین** / ş(i)nasîn/: چاوگ. ناسین ☰ شناختن

**شناو** / ş(i)naw/: ناو. ١. سۆبایی؛ مەلەوانی ٢. شنۆ؛ جۆرێ وەرزشی زۆرخانەیە ٣. ☜ **شکارتە** ☰ ١. شنا؛ شناگری ٢. شنو ٣. ☜ **شکارتە**

**شناوە** / ş(i)nawe/: ناو. پارچە زەوی پچکۆلە بۆ چاندن ☰ کشتزار کوچک

**شندڕ** / şindiř/: ئاوەڵناو. ڕیشاڵ ـ ڕیشاڵ؛ بزگوڕ و تیتاڵ ☰ پارەپورە

**شندل** / şindil/: ئاوەڵناو. بە حەوا هەڵواسراوی بە تەکەتەک ☰ مُعلّق و در نوسان

**شندۆک** / şindok/: ئاوەڵناو. *[پلار]* زورهان؛ زۆر پیر و لەکارکەوتوو ☰ پیر لکنتە

**شندۆل** / şindol/: ناو. *[پلار]* گولە؛ مێردی ژنی جوان ☰ کلمەی استهزا بە شوهر زن زیبا

**شندی** / şindî/: ناو. *[پلار]* فێڵ؛ گزی ☰ نیرنگ

**شندیمندی** / şindîmindî/: ناو. *[پلار]* حیلەوحەواڵە؛ درۆ ـ دەلەسە ☰ مکر و نیرنگ

**شنک** / şink/: ناو. جنیک؛ بان مەلاشۆ؛ هەرکام لە دوو ئێسکی پێکهێنەری تۆقی سەر ☰ آهیانە

**شنکی** / sinkî/: ناو. دەستەچیلە ☰ افروزنە

**شنگ** / şing/: ناو. ١. زۆر؛ هێز؛ تاقەت ٢. ئەسپنگ؛ ئەسپینگ؛ گیایەکی ئالیکی دووساڵان بە شیلەی سپی و چەسپن، گەڵای زراف و درێژەوە، سەوزەمەنییەکی خۆراکی و خۆڕسکی کوێستانە ٣. شینکەی کەم کە ددانی وڵاخی لێ گیر نابێ ☰ ١. نیرو ٢. گیاه شنگ ٣. سبزەی تازە برآمدە

**شنگاڵ** / şingal/: ناو. کەلانە؛ جۆرێ نانی پیاز و پیچک دەناوکراو ☰ نوعی نان

**شنگر** / şingir/: ئاوەڵناو. شڕ و دڕاو ☰ پارە

**شنگروشیواڵ** / şingir û şîwal/: ناو. خرت و پرت؛ شڕە و بڕە ☰ خرت‌وپرت

**شنگل** / şingil/: ☜ **شلنگ ـ١**

**شنگڵ** / şingił/: ☜ **شلنگ ـ١**

**شنگڵەبەرەکەتە** / sing(i)łeberekete/: ☜ **شملی‌براکە**

**شنگەبی** / singebî/: ناو. بیمشک؛ جۆرێک دارەبی کە خونچەیەکی بۆنخۆشی هەیە ☰ بیدمشک

**شنگەماینانە** / şingemaynane/: ناو. گیایەکە لە مێرگدا شین دەبێ، لاسکەکەی شیرێکی ڕەشی هەیە دەخورێ ☰ گیاهی است

**شنگین** / singîn/: دەنگەناو. ١. دەنگی هێدی و لەسەرخۆ ٢. دەنگی بەرز و بڵند ☰ ١. صدای آرام ٢. صدای بلند

**شنوه / şinwe/**: ناو. لووره‌ی گورگ 🇮🇷 زوزه‌ی گرگ

**شنۆ / ş(i)no/**: ناو. ١. ☜ **شنه** ٢. شنه‌و؛ شناو؛ جۆرێک وه‌رزشی زۆرخانه‌یی ئێرانییه 🇮🇷 ١. ☜ **شنه** ٢. شنو؛ شنا

**شنۆک / ş(i)nok/**: ناو. جووت‌په‌روانه؛ جۆرێک هیلی‌کوپته‌ره له هه‌ر دوو سه‌رییه‌وه په‌ڕه‌ی گه‌وره‌ی هه‌یه 🇮🇷 هلی‌کوپتر شنوک

**شنه[1] / ş(i)ne/**: ناو. شنۆ: ١. سروه؛ نه‌رمه‌با ٢. ڕه‌وتی هاتنی سروه ٣. له‌ره به سروه 🇮🇷 ١. نسیم ٢. وَزش نسیم ٣. خرام بر اثر نسیم

**شنه[2]**: ده‌نگه‌ناو. شنۆ؛ خنه؛ ده‌نگی تونده‌ی هه‌ناسه‌دان 🇮🇷 هِن؛ صدای نفس خسته

**شنه‌با / ş(i)neba/**: ناو. شنه؛ سروه؛ نه‌رمه‌با 🇮🇷 باد مُلایم؛ نسیم

**شنه‌شن[1] / ş(i)neşin/**: ناو. هاشه‌ی بای سروه 🇮🇷 صدای وزیدن نسیم

**شنه‌شن[2]**: ناوه‌لکار. خنه‌خن؛ هێواش به نه‌نبه‌ڵییه‌وه ‹درونه نییه شنه‌شن، ئارد پێژانه و گیان کێشان «مه‌سه‌ل»› 🇮🇷 آهسته ـ آهسته

**شنه‌شن[3]**: ده‌نگه‌ناو. ١. هاشه‌ی با ٢. ده‌نگی زۆر و له‌سه‌ریه‌کی هه‌ناسه‌ی سوار 🇮🇷 ١. صدای باد ٢. هِن ـ هِن متوالی

**شنه‌فتن / ş(i)neftin/**: ☜ **شنه‌وتن**

**شنه‌فته‌ی / ş(i)neftey/**: ☜ **شنه‌وتن**

**شنه‌و / ş(i)new/**: ☜ **شنۆ ـ٢**

**شنه‌وا / ş(i)newa/**: ناوه‌لناو. ژنه‌وا؛ خاوه‌ن توانایی بیستن 🇮🇷 شنوا

**شنه‌وتن / ş(i)newtin/**: چاوگ. شنه‌فتن؛ شنه‌فته‌ی؛ ژنه‌وتن؛ بیستن 🇮🇷 شنیدن

**شنه‌وته / ş(i)newte/**: ناوه‌لناو. بیستراو؛ بیسراو 🇮🇷 شنیده شده

**شنه‌ونه / ş(i)newinne/**: ناوه‌لناو. بیسه‌ر؛ گوێدێر؛ گوێگر 🇮🇷 شنونده

**شنیار / şinyar/**: ناوه‌لناو. شنیاره؛ کاول؛ ته‌واو وێران 🇮🇷 درب و داغان

**شنیاره / şinyare/**: ☜ **شنیار**

**شنیان / şinyan/**: ☜ **شنین**

**شنیای / şinyay/**: ☜ **شنین**

**شنین / ş(i)nîn/**: چاوگ. شنیان؛ شه‌نیان؛ شنیای: ١. هه‌ڵکردنی سروه ٢. له‌رینه‌وه له به‌ر با ٣. پێکه‌نینی ساوا ٤. ئاره‌زوو کردن؛ تاسه کردن ‹له پێ که‌وتووم و نه‌فسم بۆ هه‌وا ده‌شنێ وه‌کوو منداڵ/ له به‌ر پیری سه‌رم خۆی ناگرێت و تازه پێ ده‌گرم! «مه‌حوی»› 🇮🇷 ١. وزیدن نسیم ٢. خرامیدن بر اثر نسیم ٣. خندیدن نوزاد ۴. شنگیدن؛ هوای چیزی را در سر داشتن

**شنینه‌وه / ş(i)nînewe/**: چاوگ. ١. له‌رین له به‌ر با ٢. تریقانه‌وه‌ی منالی ساوا ‹به ده‌م دایکییه‌وه ئه‌شنایه‌وه› 🇮🇷 ١. خرامیدن از نسیم ٢. خندیدن نوزاد

**شوا / ş(i)wa/**: ناو. بزرۆکه؛ بزۆکه 🇮🇷 شوا؛ کسره‌ی خفیف/ مختلسه

**شوار / ş(i)war/**: ناو. ١. کاری شتن ٢. ڕه‌وتی پستدانی ڕه‌گ؛ چلکدان؛ چڵ دان 🇮🇷 ١. شست‌وشو ٢. ضربان

⊡ **شوار کردن**: بالاو کردن؛ جل شتن 🇮🇷 رخت شستن

**شوار گرتن**: پتی ڕه‌گ ژماردن 🇮🇷 نبض گرفتن

**شوارای / ş(i)waray/**: چاوگ. گووشران 🇮🇷 فشُرده شدن

**شوارته‌ی / ş(i)wartey/**: چاوگ. گوشین 🇮🇷 فشُردن

**شوارۆ / ş(i)waro/**: ناو. نه‌بز؛ شوار؛ پت؛ چل 🇮🇷 نبض

**شواریای / ş(i)waryay/**: چاوگ. گوشین 🇮🇷 فشُردن

**شواش‌بینک / ş(i)waşbînik/**: ناو. ١. دارێکه ٢.

جۆرێ هەنجیرە ☰ ١. درختی است ٢. نوعی انجیر

**شواڵ** / ş(i)wał/: ناو. شالوار؛ شەرواڵ؛ شەواڵ؛ شەواڵ؛ شارواڵ؛ شەڵوار؛ شاپک؛ پانتۆڵ؛ پاتۆڵ؛ پانترۆڵ؛ پاتۆڵێ؛ پاپۆش؛ ڕانک؛ دوولینگە؛ پۆشەنێ بۆ پشتێنە بەرەو خوار، بە دوولنگەوە کە هەر لنگێکی پایەک تا قولەپێ دادەپۆشێ ☰ شلوار

**شواڵپلیت** / ş(i)wałp(i)łît/: ☜ **شواڵچەپەڵ**

**شواڵپیس** / ş(i)wałpîs/: ☜ **شواڵچەپەڵ**

**شواڵچەپەڵ** / ş(i)wałçepeł/: ئاوەڵناو. *[مەجازی، پلار]* شواڵپیس؛ شواڵپلیت؛ داوێنپیس ☰ زناکار

**شواڵک** / ş(i)wałik/: ناو. تووڵ؛ لکی باریک و براوی دار بی ☰ ترکەی بید

**شوان** / ş(i)wan/: ناو. شڤان؛ شیڤان؛ شڤوون؛ بەرڤان؛ بەربێر؛ چوپوو؛ گەلەوان؛ ڕانەوانێ کە ئاژەڵ دەلەوەڕێنێ و چاودێرییان لێوە دەکا (بەتایبەت کەسێ کە ڕانەکە هی خۆی نییە و بە مز کار دەکا) ☰ چوپان

**شوانانە**[1] / ş(i)wanane/: ناو. شەرتەشوانی؛ مزی شوان ☰ مُزد چوپانی

**شوانانە**[2]: ئاوەڵناو. سەر بە شوان ‹ژیانی شوانانە› ☰ چوپانی

**شوانخاپێن** / ş(i)wanxapên/: ☜ **شوانخڵەتێنە**

**شوانخڵەتێن** / ş(i)wanx(i)łetên/: ☜ **شوانخڵەتێنە**

**شوانخڵەتێنە** / ş(i)wanx(i)łetêne/: ناو. شڤانخاپێن؛ شڤانکوژ؛ شوانخاپێن؛ شوانخەڵەتێن؛ شوانخڵەتێن؛ شوانگێلکەرە؛ شوانهەڵخەڵەتێنە؛ شوانخەڵەتێنە؛ شوانەخەڵەتن؛ گەوریلە؛ تۆرەمە باڵندەیەکن نزیک ٢٠ تا ٢٥ سانتیمیتر دەبن، بە شەو یان بوولێڵ دەکەونە جموجووڵ، چاویان گەورەیە، زاریان زەلامە، لاق و دندووکیان کورتە، پەڕ و باڵیان مەیلەو بۆری ڕێ - ڕێی پڕخەت و خاڵە و لەگەڵ خاکدا یەک ڕەنگ دەنوێنن، بێدەنگ دەفڕن، تەنیا دەژین و لە سەر زەوی هێلانە دەکەن، چەن جۆریان هەیە ☰ شبان‌فریبک

**شوانخەڵەتێن** / ş(i)wanxełetên/: ☜ **شوانخڵەتێنە**

**شوانخەڵەتێنە** / ş(i)wanxełetêne/: ☜ **شوانخڵەتێنە**

**شوانشوان** / ş(i)wanş(i)wan/: ناو. شوانشوانەکێ؛ کایەیێکی منالانە ☰ از بازی‌های کودکان

**شوانشوانەکێ** / ş(i)wanş(i)wanekê/: ☜ **شوانشوان**

**شوانکارە** / ş(i)wankare/: ناو. ١. ڕەوتی مالات بەخێو کردنی بە نیوەیی ٢. کەسێ کە کاسبی هەر شوانییە ٣. هۆزێکی گەورە و مێژینەی کورد ٤. گیایەکی بۆنخۆشە ☰ ١. پرورش‌دهنده‌ی دام که نصف آن متعلق به خود او است ٢. کسی کە کار ثابتش چوپانی است ٣. عشیره‌ای بزرگ و کُهن از کُردها ۴. گیاهی خوشبو

**شوانگێلکەرە** / ş(i)wangêlkere/: ☜ **شوانخڵەتێنە**

**شوانەخەڵەتن** / ş(i)wanxełetin/: ☜ **شوانخڵەتێنە**

**شوانەیی** / ş(i)waneyî/: ☜ **شوانی**

**شوانهەڵخەڵەتێنە** / ş(i)wanhełxełetêne/: ☜ **شوانخڵەتێنە**

**شوانی**[1] / ş(i)wanî/: ناو. شوانێتی؛ شوانەیی؛ شڤانی؛ ڕامیاری؛ شەوونی؛ کار و پیشەی شوان ☰ چوپانی؛ شبانی

**شوانی**[2]: ئاوەڵناو. شوانێتی؛ شوانەیی؛ شڤانی؛ پەیوەندیدار یان سەر بە شوان ‹ژیانی شوانی› ☰ چوپانی؛ شبانی

**شوانێتی** / ş(i)wanêtî/: ☜ **شوانی**

**شوبات / şubat/**: ناو. فێڤرییە؛ مانگی دووهەمی ساڵی هەتاوی لە ڕۆژژمێری بڕێ لە وڵاتە عەرەبییەکاندا، کە لە ١٠ی ڕێبەندانەوە دەست پێ دەکا ☰ ماه فوریه

**شوبانێر / şubanêr/**: ناو. مەکۆی دزان؛ بنکەی دزان ☰ مقر راهزنان

**شوبهاندن / şubhandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //شوبهاندت؛ دەشوبهێنی؛ بشوبهێنە// چواندنی کەس یا شتێک بە کەس یان شتانی‌ترەوە کە لە بڕێ تایبەتمەندیدا وەک یەکن ‹شاعیر خەمی بە تەم شوبهاندووە› ☰ تشبیه کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەشوبهاندن

**شوبهین / şubhîn/**: چاوگ. لێک‌چوونی کەس یان شتێک لە کەس یان شتانی‌تر بە هۆی بڕێ تایبەتمەندی هاوبەشەوە ☰ مشابه بودن

**شوبهێنران / şubhênran/**: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //شوبهێنرای؛ دەشوبهێنرێی؛ بشوبهێنرێ// وێنەی یەک یا نزیک بە یەک زانران بە بۆنەی هەبوونی چەن تایبەتمەندی هاوبەشەوە ‹زوڵف بە مار و ڕوومەت بە مانگ شوبهێنراوە› ☰ تشبیه شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: شوبهێنراو/ چاوگی نەرێنی: نەشوبهێنران

**شوبهێنراو[1] / şubhênraw/**: ناو. ئەوی تەشبێ کراوە بە شتێکی ترەوە ☰ مُشبَّه

**شوبهێنراو[2]**: ئاوەڵناو. تەشبێ کراو؛ وەک شتێ زانراو ☰ تشبیه شده

**شوتاندن / şutandin/**: ☜ سوتاندن

**شوتر / şutir/**: ☜ وشتر

**شوتران / şutran/**: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //شوترای؛ دەشوترێی؛ بشوترێ// شۆردران ☰ شسته شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: شوتراو/ چاوگی نەرێنی: نەشوتران

**شوتراو / şutraw/**: ئاوەڵناو. شتراو؛ شردوو ☰ شُسته شده

**شوتک / şut(i)k/**: ناو. شۆرتکە؛ جۆرێ کەمەربەندی لە ئاوریشم چنراو ☰ نوعی کمربند

**شوتن / şutin/**: ☜ شۆردن

**شوتوکوت / şut û kut/**: ناو. کاری پێداماڵین و لێدانی لەنکاو ☰ ضربەی ناگهانی

**شوتین / şutîn/**: ☜ شیربرنج

**شوخڵ / şux(i)ł/**: ☜ شوغڵ

**شور / şur/**: ناو. جۆش؛ شیر؛ شۆر ☰ هیجان؛ جوش و خروش

**شورتان / şurtan/**: ناو. خیگە؛ هیزە؛ پێستە ☰ خیک

**شورحە / şurĥe/**: ناو. قەڵا؛ قەڵات ☰ قلعه

**شوڕ[1] / şuř/**: ☜ شڕ[2]

**شوڕ[2]**: ☜ شوڕە

**شوڕە / şuře/**: دەنگەناو. شوڕ؛ چۆڕە؛ دەنگی ڕژانی ئاو ☰ صدای ریزش آب

⊡ **شوڕە کردن** چۆڕە کردن؛ ڕژان وێڕای دەنگ لێوە هاتن ☰ ریختن و شُرشُر کردن

**شوڕە هاتن** دەنگی ڕژانی تراو هاتن ☰ صدای شُرشُر آمدن

**کەوتنە شوڕەوە** لە بەرێکەوە چۆڕە کردن ☰ بە شُرشُر افتادن

**شوڕەشوڕ / şuřeşuř/**: دەنگەناو. شۆڕەشۆڕ؛ چۆڕەچۆڕ؛ دەنگی ڕژانی ئاو بە شوێن یەکا ☰ شُرـ شُر پیاپی آب

**شوستوشۆ / şust û şo/**: ☜ شت‌وشۆ

⊡ **شوستوشۆ دان** ١. شتنەوەی دانەوێڵە ٢. ☜ **شت‌وشۆ دەرێتان** ☰ ١. شُستن حبوبات ٢. ☜ **شت‌وشۆ دەرێتان**

**شوستوشۆ دەرێنان** ☜ **شت‌وشۆ دەرێتان**

**شوس‌وشۆ / şus û şo/**: ☜ شت‌وشۆ

**شوس‌یەخ / şusyex/**: ناو. چلوورە؛ زەمبەلیک؛

سەهۆڵی بە شاخ و گوێسوانەدا شۆڕەوەبوو ⧉ دنگالە

**شوشتن / şuştin/:** ☜ **شۆردن**

**شوشو / şuşû/:** ناو. سپل؛ ئەسپوول؛ ؛ سەپەل؛ سوویە؛ تاڵ ⧉ طحال؛ سپُرز

**شوشویەهەر / şuşûyeher/:** ناو. جەرگ و ناو ⧉ جگر و دل و قلوە

**شوعلە / şu'le/:** ناو. ١. گڕی چرا و ئاگر ٢. تیشکی ئاگر ⧉ ١. شُعلە ٢. روشنایی آتش

**شوغاڵ / şuğał/:** ناو. چەقەڵ؛ تۆڕی ⧉ شُغال

**شوغڵ / şuğ(i)ł/:** ناو. شوخڵ؛ ئیش؛ شوول؛ کار ⧉ شُغل

**شوفار / şufar/:** ☜ **شوفار**

**شوڤینیست / şuvînîst/:** ناوەڵناو. *(پ.لار)* زێد و نەتەوەپەرستی وا کە بەختەوەری و تەنانەت گیانی خەڵک و میللەتانی تری لە لا بێبایەخ بێ ⧉ شوونیست

**شوڤینیسم / şuvînîsm/:** ناو. زێد و نەتەوەپەرستی لە ڕادەبەدەر و دوور لە ئاوەز ⧉ شوونیسم

**شوقاق / şuqaq/:** ☜ **شوقاقی**

**شوقاقی / şuqaqî/:** ناو. شوقاق: ١. نەخۆشییەکی ئاژەڵە، سمیان دەقڵەشێ ٢. سەرمای دە ڕۆژی سەرەبەهار ⧉ ١. بیماری ترکیدن سُم حیوان ٢. سرمای ده روز اول فروردین

**شوقڵ / şuq(i)l/:** ناو. کەشۆل؛ گاگۆز؛ پۆڵکە ⧉ نخود فرنگی

**شوقە / şuqe/:** ناو. ١. سویت؛ وارخانێکی بچووک کە ژووری جیاوازی نییە ٢. وارخان؛ ئاپارتمان ⧉ ١. سوئیت ٢. آپارتمان

**شوقەلەت / şuqelet/:** ناو. ستێرک؛ سەکۆی ڕەشماڵ ⧉ سکوی سیاەچادر

**شوکا / şuka/:** ناو. گازە؛ گازندە؛ شکات ⧉ شکایت

**شوکر / şuk(i)r/:** ناو. شکر؛ سپاس؛ سوپاس ⧉ شُکر

**شوکرانە / şukrane/:** ناو. ١. کاری خێر دان لە مزگێنی ڕووداوی دڵخۆشکەر ٢. کاری شوکری شتێ بەجێ هێنان ⧉ ١. مُژدگانی ٢. شکرگزاری

**شوکرانەبژێر / şukraneb(i)jêr/:** ناوەڵناو. ١. شوکرخاز؛ شوکرخواز؛ سپاسکار ٢. دڵتێر؛ چاوتێر؛ خۆشحاڵ و دڵنیا بە بەشی خۆی و لە هەلومەرجێ کە تێیدایە ⧉ ١. سپاسگُزار ٢. قانع

**شوکرانەبژێری / şukraneb(i)jêrî/:** ناو. شوکرخوازی؛ سپاسکاری ⧉ سپاسگزاری

**شوکرخاز / şukrxaz/:** ☜ **شوکرانەبژێر-١**

**شوکرخواز / şukrx(i)waz/:** ☜ **شوکرانەبژێر-١**

**شوکرخوازی / şukrx(i)wazî/:** ☜ **شوکرانەبژێری**

**شوکلات / şuklat/:** ناو. شوکولات؛ چاکلێت؛ چکلیت؛ جۆرێک شیرینی لە کاکائوو و شەکر ⧉ شُکلات

**شوکولات / şukulat/:** ☜ **شوکلات**

**شولگسە/şulg(i)se/:** ناوەڵناو. پس-پس؛ لەت-لەت؛ کوتولەت ⧉ پارە-پورە

**شولگەنە / şulgene/:** ناوەڵناو. لەناوچوو؛ ڕیشەبڕ ⧉ ریشەکن

**شولۆپە / şulope/:** ☜ **شلێوە**

**شولە / şule/:** ناو. ١. پێمەرە قوڕ؛ پڕی بێڵێ حەڕی ٢. شلە؛ چێشتی تراو ⧉ ١. پُر یک بیل گِل ٢. آش

**شولەم / şulem/:** ناو. ورگ؛ زگ ⧉ شکم

**شولەمە / şuleme/:** ناو. بەرچێڵە؛ بەرخەبەبە ⧉ غبغب

**شولهە / şulhe/:** ناو. شلخە؛ کەنوو؛ خڵێف؛ پوورەی هەنگ ⧉ کندو

**شولی / şulî/:** ☜ **شلی**

**شوم[١] / şum/:** ناو. شێو؛ شام؛ نانی شەو ⧉ وعدەی شام

**شوم**[٢]: ☜ **شووم**

**شومینه / şumîne/**: ناو. سۆپای نێو دیوار ☒ شومینه

**شون / şun/**: ☜ **شوێن**

⊡ **شون داشاندن**: ناردنه دوو ☒ از پی فرستادن

**شوناس / şunas/**: ☜ **شناس**

**شوناسایی / şunasayî/**: ☜ **شناسایی**

**شوناسی / şunasî/**: ☜ **شناسی**

**شونوار / şunwar/**: ☜ **شوێنەوار**

**شووار / şuwar/**: ناو. باروو؛ دیواری بەرز ☒ برج و بارو

**شوەشینە / ş(i)weşîne/**: ناو. گیایەکە لە تیرەی گەزگەسک ☒ گیاهی از تیرەی گزنه

**شوەم / ş(i)wem/**: ☜ **شێف**

**شوهۆڕ / şuhoř/**: ناو. لقی باریک و تەرچکی دار ☒ شاخه نازک و شاداب

**شوێت / ş(i)wît/**: ناو. شێوت؛ شیوت؛ شوێتە؛ شووتە؛ دوراخ؛ تۆراغ؛ گیایەکە لە سەوزەوات بە گەڵای وردی چەترئاساوە کە گەڵاکەی وەک هەزوێلە دەیکەنە چێشتەوە ☒ شبت؛ شوید

**شوێتک / ş(i)wîtik/**: ناو. شووتک؛ کەمەربەند؛ پشتوێنی قایش ☒ کمربند

**شوێتە / ş(i)wîte/**: ☜ **شوێت**

**شوێڵ / ş(i)wêł/**: ناو. باریکە زەوی ☒ زمین زراعتی کم‌عرض

**شوێڵە / ş(i)wêłe/**: ناو. باریکەیەک لە هەر شت ☒ نواری باریک از هر چیز

**شوێن / ş(i)wên/**: ناو. شون؛ شۆن؛ شوون؛ شوێنە؛ شووین: ١. جێگا؛ جێ ‹شوێنی شێرە و ڕێوی گێرەی تیا ئەکا «مەسەل»› ٢. شۆ؛ شۆپ؛ شوێنەوار ٣. خەت؛ کێر ٤. دوا؛ دما؛ دوما ☒ ١. جای ٢. اثر؛ رد ٣. شیار ٤. دنبال

⊡ **شوێن خستن**: بە دوودا ناردن ☒ بە تعقیب فرستادن

**شوێن کردن**: خەتدار کردن؛ نیشانە کردن بە تیخ ☒ شیار زدن

**شوێن کردنەوە/ کرنەوە**: جێگە پێ دان ☒ جای دادن

**شوێن کەفتن**: ☜ **شوێن کەوتن**

**شوێن کەوتن**: شوێن گرتن؛ شوێن کەفتن: ١. وەدوو کەوتن؛ دانە پەی ٢. چاو لێ بڕین؛ پەیڕەوی کردن ☒ ١. تعقیب کردن ٢. پیروی کردن

**شوێن گرتن**: ☜ **شوێن کەوتن**

**شوێن گێڕان**: دانە پەی؛ شۆ ئاژۆتن ☒ ردیابی کردن

**شوێن هەڵگردن**: شوێن دۆزینەوە ☒ رد یافتن

**شوێن هەڵگرتن**: بە شوێندا چوون ☒ جستجو کردن

**چوونە شوێن کەسێ یان شتێکدا**: بۆ هێنانی کەسێ یان شتێ، کەوتنە ڕێ. هەروەها: **ناردنە شوێن کەسێ یان شتێکدا** ☒ دنبال کسی یا چیزی رفتن

**خستنە شوێن کەسێ یان شتێکەوە**: کەسێ بۆ مەبەستێ بۆ شوێنگری کەس یان شتێ ڕێخستن. هەروەها: **کەوتنە شوێن کەسێ یان شتێکەوە** ☒ کسی را بە تعقیب کسی یا چیزی فرستادن

**نانە شوێن کەسێ یان شتێکەوە**: بە هەڵاتن ڕاوەدوونانی کەس یان شتێک ☒ دنبال کسی یا چیزی دویدن

**شوێن‌بەشوێن / ş(i)wênbeş(i)wên/**: ئاوەڵکار. دوا بە دوا ☒ سایە بە سایە

**شوێن‌پا / ş(i)wênpa/**: ناو. شۆپ؛ شۆب ☒ ردِ پا

**شوێن‌پەنجە / ş(i)wênpence/**: ناو. تەپڵ؛ جێ‌قامک ☒ اثر انگشت

**شوێنک / ş(i)wênik/**: ناو. تێڵای پەلکەدار کوتان ☒ کدینە؛ برگ‌کوب

**شوێنکەفتگ** / ş(i)wênkeftig/: ☜ شوێنکەوتو

**شوێنکەفتە** / ş(i)wênkefte/: ☜ شوێنکەوتو

**شوێنکەوتو** / ş(i)wênkewtû/: ناو. شوێنکەوتە؛ شوێن کەفتگ؛ شوێنکەفتە؛ شوێنگر؛ وە دوا کەوتوو ⁂ پیرو

**شوێنکەوتە** / ş(i)wênkewte/: ☜ شوێنکەوتو

**شوێنگر** / ş(i)wêngir/: ☜ شوێنکەوتو

**شوێنگری** / ş(i)wêng(i)rî/: ناو. حەجامات؛ حەجامەت ⁂ حجامت

**شوێن‌گومەکێ** / ş(i)wêngumekê/: ناو. شۆن‌گومەکێ؛ شوێنەگومکێ؛ شوێنەونکە؛ شوێنەونکێ؛ شوێنەونی؛ شوێنەونێ: ١. کاری هەزارە کردنی نچیر بە نەهێشتنەوە یان گۆڕینی شوێنی خۆ ٢. جۆرێ فریوکاری بۆ دەرنەکەوتنی ناو یان شوێنی تاوانبار ⁂ ١. فریب شکار ٢. عمل رد گُم کردن

**شوێنگیر** / ş(i)wêngîr/: ناو. پەیجۆر؛ دواگەڕ ⁂ پیگیر

**شوێنگێڕ** / ş(i)wêngêř/: ☜ شۆپاژۆ

**شوێنەبرین** / ş(i)wêneb(i)rîn/: ناو. ئالگ؛ شوێنی زام یا لێکەوتن ⁂ اثر زخم یا ضربت

**شوێنەزا** / ş(i)wêneza/: ناو. زاگە؛ جێگەی لە دایک بوون ‹شوێنەزای پیری شیعری گۆرانی/ لە حەوت پیت پێکدێ وشەی دوولانی «گۆران»› ⁂ زادگاه

**شوێنەگومکێ** / ş(i)wênegumkê/: ☜ شوێن‌گومەکێ

**شوێنەوار** / ş(i)wênewar/: ناو. شونوار؛ شۆنەوار؛ شێنەوار: ١. ئاسەوار؛ شۆنەما؛ نیشانگەی ڕابردوان ٢. شۆن؛ شوێن؛ شۆپ؛ ڕەت ‹کیژێک خۆی لە ژوور کوتاوە، دەرکەی حەوشەکەی پێوەدا/ ئیتر شوێنەواری جوانی، بەدی ناکەم لەم نێوەدا «هێمن»› ٣. نەوە و ناتۆرە ٤. کارتێکەری ⁂ ١. آثار بە جای ماندە ٢. رد؛ اثر ٣. نوە و نتیجە ۴. تأثیر

**شوێنەواربڕاو** / ş(i)wênewarb(i)řaw/: ناوەڵناو. بن‌بڕ؛ بنەبڕ ⁂ ریشەکن

**شوێنەونکە** / ş(i)wênewinke/: ☜ شوێن‌گومەکێ

**شوێنەونکێ** / ş(i)wênewinkê/: ☜ شوێن‌گومەکێ

**شوێنەونی** / ş(i)wênew(i)nî/: ☜ شوێن‌گومەکێ

**شوێنەونێ** / ş(i)wênew(i)nê/: ☜ شوێن‌گومەکێ

**شوێنهات** / ş(i)wênhat/: ☜ شۆنەما ـ١

**شوێن‌هەڵگر** / ş(i)wênhełgir/: ناو. شۆپ‌هەڵگر؛ شۆپاژۆ؛ شۆپگەر؛ کەس یان کەرەسەیەک کە لای ڕۆیشتن یان شوێنی کەسێ یا شتێ دەدۆزێتەوە ⁂ ردیاب

**شوێن‌هەڵگری** / ş(i)wênhełg(i)rî/: ناو. کاری دۆزینەوەی شوێنی ڕۆیشتنی کەسێ یان تێپەڕ بوونی شتێ ⁂ ردیابی

**شۆ**[١] / şo/: ناو. ١. دەق؛ دەقی پارچە و کووتاڵ ٢. کاری کێلانی زەوی ٣. شێو؛ شێف؛ زەوی کێڵدراو ٤. کاری شتن؛ شۆردن ٥. تەڕایی؛ نم؛ شە ٦. کار و ڕەوتی چوون؛ ڕۆیشتن ‹ئام و شۆ› ٧. شۆپ؛ شوێن ٨. ئەندازە و ئەژمار ‹وەفای چەرخ چەپ ڕاس بێ تان‌وپۆن/ جەفا بێ‌پایان دەردسەر بێ‌شۆن «مەولەوی»› ⁂ ١. آهار ٢. شُخم ٣. زمین شُخم‌زدە ۴. شستشو ۵. نَم ۶ عمل رفتن ۷. رد؛ اثر ۸ اندازە؛ حد

⊡ **شۆ بڕین**: ١. شێف بڕین؛ کێلانی زەمین ٢. شوێنەوارێ (لە شتێ) نەهێشتنەوە ⁂ ١. شُخم زدن ٢. اثری (از چیزی) باقی نگذاشتن

**شۆ دان**: دەقاق لێ دان ⁂ آهار زدن

**لە شۆ دەرچوون**: بێتام بوون؛ تام تێدا نەمان؛ لە حەد لادان. هەروەها: **لە شۆ دەرکردن** ⁂ از حد گذشتن

**شۆ**[٢]: پاشەوشە. ـ شۆر ‹سەرشۆ› ⁂ ـ شو

**شۆب** / şob/: ☜ شۆپ ـ١

**شۆباش** / şobaş/: ☜ شاباش

**شۆباو** / şobaw/: ☜ **شۆرباو-١**

**شۆبە** / şobe/: ناو. ١. چۆنیەتی بوورانـەوە؛ دۆخـی لە هۆش چوون بە هـۆی تـرس، نەخۆشـی یـان ماندوویەتییەوە ٢. شۆکە؛ شەڤی؛ شـەتە؛ ترتـول؛ مێروویـەکی وردی ڕەشـە بـە گـەزۆی دارەوە دەنیشێ و خەساری دەکـا ☜ ١. غـش ٢. شـتەی درخت

**شۆپ** / şop/: نـاو. ١. شـۆب؛ شـوێنپـا ٢. زللە؛ شەقەزیلە ٣. کاری بە لـەپی دەسـت لـە سـەری شـتێ دان ٤. پـارووی زل ٥. داری ژێردەرانـەی درگا ☜ ١. ردِ پا ٢. سیلی ٣. عمل با کـف دسـت بـر چیزی زدن ۴. لُقمەی بزرگ ۵. عتبە؛ چوب آسـتانەی در

**شۆپا** / şopa/: ناو. سامۆرتە؛ سامۆتە ☜ فتراک

**شۆپاژۆ** / şopajo/: نـاو. شـوێنگێڕ؛ شـوێنهەڵـگر؛ شۆپگەڕ؛ شۆپهەلگر؛ کەسێک یـان کەرەسـەیێ کە لای ڕۆیشتن یـا شـوێنی کەسـێ یـان شـتێ دەدۆزێتەوە ☜ ردگیر؛ ردشناس

**شۆپاو** / şopaw/: ☜ **شۆرباو-١**

**شۆپایی** / şopayî/: ناو. پاشکۆ؛ شتێ کـە بـە بـەن سامۆرتەوە بەسرابێ ☜ آنچە بە فتراک می‌بندند

**شۆپگەر** / şopger/: ☜ **شوێنهەڵگر**

**شۆپگەڕ** / şopgeř/: ☜ **شۆپاژۆ**

**شۆپهەڵگر** / şophełgir/: ☜ **شۆپاژۆ**

**شۆت** / şot/: ناو. شیر ☜ شیر

**شۆتک** / şotik/: نـاو. شـۆرتک؛ شـۆرتکە؛ شـۆرکە؛ شۆرگە؛ جێگەی خۆ شتن لە ماڵدا ☜ جای آبتنـی در خانە

**شۆتە** / şote/: نـاو. شـاخ؛ سـترۆ؛ سـتروو ☜ شـاخ حیوان

**شۆتی** / şotî/: ناو. گیای شیردار ☜ گیاە شیردار

**شۆتیلە** / şotîle/: ناو. خوشیلک؛ گیایەکی شیردارە ☜ گیاهی است شیردار

**شۆتینە** / şotîne/: ناو. فرنی؛ محەللەبی؛ ئاردەبرنج و شیری کوڵاو ☜ فرنی

**شۆخ**[١] / şox/: ناو. ١. سـپیندار؛ سـپیدار ٢. کـاری شاخ وەشاندن ☜ ١. سپیدار ٢. عمل شاخ زدن

**شۆخ**[٢]: ئاوەڵـناو. ١. پێکـەوتوو؛ جـوان و لـەبار ‹بـە دەندان شەککەر و قەندەن، بە بالا شۆخی دڵبەندەن/ هـەزار دڵ پـەیش ئەرامەنـدەن، یـەکێ چـون پـیر کـەنعانی «شـێخ شـەهاب کاکۆزەکـەریایی»› ٢. قسەخۆش؛ گاڵتەکەر ٣. شاد؛ بێخەم ‹خـاترێکی شۆخ و خۆش و بێغەم و جەمعم هـەبوو/ ئێسـتە بـۆ زوڵفی کەسێ مەشقی پەرێشانی دەکا «نالی»› ☜ ١. زیبای رعنا ٢. شوخ‌طبع ٣. شاد

**شۆخوشەنگ** / şox û şeng/: ئاوەڵـناو. ١. دڵـبەری جوان و پێکەوتوو ‹نەغمەی یاری شۆخوشەنگ بـێ/ زرەی بـازن بـێ/ بـەرەولای مـن بـێ «گـۆران»› ٢. تەرپۆش؛ خۆشپۆش ‹تەواو ئێـرانی خۆمـانم وە بـیر هاتەوە: ئەفسەر شۆخوشەنگ و جل‌تازە، سەرباز ڕووت و نیوەپێخواس و پینە بە قنگـەوە! «هـەژار، چێشـتی مجێور»› ☜ ١. دلرُبا ٢. شیک‌پوش

**شۆخوشەنگی** / şox û şeng/: ناو. قۆزی؛ جـوانی ☜ برازندگی

**شۆخی** / şoxî/: نـاو. ١. جـوانی و ڕێـکوپێکـی ٢. حەنەک؛ گاڵتە ☜ ١. زیبایی و دلرُبـایی ٢. شـوخی؛ مزاح

**شۆخیباز** / şoxîbaz/: ئاوەڵناو. شۆخیچـی؛ شـۆخ؛ قسەخۆشی گاڵتەکەر ☜ شوخی‌باز

**شۆخیچی** / şoxîçî/: ☜ **شۆخیباز**

**شۆدار** / şodar/: ئاوەڵـناو. ١. نمـدار ٢. دەقدراو؛ کەتیرەلێدراو ☜ ١. نمناک ٢. آهارزدە

**شۆر**[١] / şor/: نـاو. ١. سـۆزەی دەروون؛ خـەمی ئەڤین ‹کـە دێم ئیزهـاری شـۆر و شـینی دڵ کـەم، بەلکی ڕەحمـێ کـا/ بـە خەنـدە دێ، دەڵـێ خۆڵـی بەسەردا بێژن ئەم هارە! «مەحوی»› ٢. هەوا؛ زیـچ؛

هەیەجان ‹هەستان لە خەوی غەفلەتە ئەسبابی نەجاتم/ نایدەم بە فەلەک زەمزەمە و شۆری ولاتم «موفتی تووتوونچی»› ۳. دەزگایەکی مووسیقای ئێرانی و عەرەبی ٤. گیا و میوەی لە ناو سرکە و خوێواودا هەڵگیراو ٥. گیایەکی گەڵاوردی ساقەت سوورە لە شوێنی مەیلەو شۆرەکات شین دەبێ ٦. ڕەوانی زگ ☰ ۱. سوز درون ۲. شور؛ هیجان ۳. دستگاه شور در موسیقی ایرانی و عربی ۴. شور؛ گیاه و میوەی در سرکه و نمک مانده ۵. گیاهی است ۶. اسهال

**شۆر**[۲]: ئاوەڵناو. ۱. سوێر؛ سوێل؛ سوور؛ بە تامی خوێ ‹سیوای زات وێت شاه بێ‌زەوال/ نه شۆر، نه شیرین، نه ترش و نه تاڵ «میرزا عەبدولقادری پاوەیی»› ۲. ڕەوانکەر؛ کارکون؛ بۆ خۆراک یان دەرمانێک دەگوترێ کە ڕیخۆڵە بخاتە کار و پاکی بکاتەوە ☰ ۱. شور ۲. مُسهل

**ـ شۆر**[۳]: پاشەوشە. ۱. سوێل ‹خەیارشۆر› ۲. بشۆر ‹جلشۆر› ☰ ۱و۲. ـ شور

**شۆرا** / şora/: ناو. شوورا: ۱. ڕاوێژ؛ هاوبیری ۲. جڤات؛ تاقمێ کە بۆ ڕاوێژ کردن لە کارێکدا کۆ دەبنەوە ۳. ڕاوێژگە؛ ڕابێژگە؛ ئەنجومەن؛ شوێنێ کە بۆ ڕاوێژ تێدا کۆ دەبنەوە ☰ ۱تا۳. شورا

**شۆراب** / şorab/: ناو. پەلکەدارە تریی خوێ کراوی وشک‌کراو بۆ زستان ☰ برگ مو نمک‌سود

**شۆراخ** / şorax/: ☜ **شۆرەکات**

**شۆران** / şoran/: چاوگ. تێنەپەڕ. //شۆرای؛ دەشۆرێی؛ بشۆرێ// شۆریان؛ شۆرین: ۱. ڕاپەڕین بە توورەیی ۲. شۆریان؛ شۆردران؛ وە بەر شۆردن کەوتن ☰ ۱. شوریدن ۲. شُسته شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: شۆراو/ چاوگی نەرێنی: نەشۆران

**شۆرانەوە** / şoranewe/: ☜ **شۆرینەوە**

**شۆرانەوە** / şoranewe/: چاوگ. شۆریانەوە؛ شۆردرانەوە ☰ شُستشو داده شدن

**شۆراو**[۱] / şoraw/: ناو. ئاوی سوێر ‹دیدەم هەموو شۆراوە بە شۆراوی سوروشکم/ لەم لەوحە نیگارینە نە عەین و نە ئەسەر ما «نالی»› ☰ آب شور

**شۆراو**[۲]: ئاوەڵناو. شۆریاگ؛ شۆریاو؛ بە ئاو خاوێن کراو ☰ شُسته

**شۆراوە** / şorawe/: ئاوەڵناو. شۆراوەوە؛ خاوێن کراوە بە ئاو ☰ شستشو داده شده

**شۆراوەوە** / şorawewe/: ☜ **شۆراوە**

**شۆربا** / şorba/: ☜ **شۆرباو**

**شۆرباڕێژ** / şorbařêj/: ☜ **شۆرباوڕێژ**

**شۆربافڕکەر** / şorbafiřker/: ☜ **شۆرباهەڵقۆڕێن**

**شۆرباو** / şorbaw/: ناو. شۆربا؛ شۆربە؛ شۆروا: ۱. شۆباو؛ شۆپاو؛ چێشتی تراو ۲. قسڵاو ☰ ۱. شوربا ۲. آب آهک

**شۆرباوئارد** / şorbaw'ard/: ناو. هەڤدەل؛ ئارد و ئاوی پێکەوە کوڵاو ☰ مخلوط آرد و آب جوشیده

**شۆرباوڕێژ** / şorbawřêj/: ئاوەڵناو. شۆرباڕێژ؛ شۆرواڕێژ؛ بە قسڵاو داڕژاو ☰ دوغاب ریز

**شۆرباوڕێژکراو** / şorbawřêjk(i)raw/: ئاوەڵناو. جاڕووبەند؛ قسڵ و خۆڵەمێش تێ‌هەڵسواو؛ بە قسڵ سواغدراو ☰ ساروج اندود

**شۆرباوگۆشت** / şorbawgoşt/: ناو. ئاوگۆشت؛ شۆرباوی گۆشت ☰ آبگوشت

**شۆرباهەڵقۆڕێن** / şorbahełqořên/: ئاوەڵناو. شۆربافڕکەر؛ گەرمەوەر؛ شۆربافڕکەر ☰ آش‌آشام

**شۆربە** / şorbe/: ☜ **شۆرباو**

**شۆرت** / şort/: ناو. ۱. تونکە؛ توونکە؛ ژێرشواڵ ۲. تکەی دڵۆپە ☰ ۱. شورت ۲. چکّه

**شۆرتان** / şortan/: ناو. ۱. خیگە؛ هیزە؛ پێستە ۲. پەنیری خیگە ☰ ۱. خیک ۲. پنیر آگنەی خیک

**شۆرتک** / şortik/: ☜ **شۆتك**

**شۆرتکە** / şortke/: ناو. ۱. ☜ **شۆتك** ۲. شوتک؛

جۆرێ کەمەربەندی لە ئاوریشم چنراو ‹شۆرتکە و کەمەرە هەیاسەیی پشت/ گۆیەخە تا خوار جوانترین لە گشت «قانع»› ☰ ١. ☜ **شۆتك** ٢. نوعی کمربند

**شۆرتەی** / şortey/: چاوگ. شۆردن ☰ شُستن

**شۆرجە** / şorce/: ناو. هـالاو؛ چێشـتی بەرسـیلە؛ شیوی قۆرە ☰ آش غورە

**شـۆردران** / şord(i)ran/: چـاوگ. تێنەپـەڕ. نادیـار. //شۆردرای؛ دەشـۆردرێی؛ بشـۆردرێ// شـۆریان ☰ شسته شدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: شـۆردراو/ چاوگی نـەرێنی: نەشۆردران

**شۆردراو** / şord(i)raw/: ئاوەڵناو. شۆردراوە؛ بـە ئـاو خاوێنەوەکراو؛ شۆراو ☰ شُسته

**شۆردراوە** / şord(i)rawe/: ☜ **شۆردراو**

**شۆردن** / şordin/: چاوگ. تێپەڕ. //شۆردت؛ دەشۆری؛ بشۆرە// شتن؛ شردن؛ ششتن؛ شووشتن؛ شـوتن؛ شووتن: ١. بە ئاو یان هـەر تراوێکیـتـر خـاوێن کردنەوە ٢. *[کینایە]* شۆردنەوە؛ سـەرکۆنە کـردن و جوێن پێ دان ☰ ١. شُسـتن ٢. سـرزنش کـردن و دُشنام دادن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەشۆردن

**شـۆردنەوە** / şord(i)newe/: چـاوگ. شـستنەوە؛ شردنەوە؛ ششتنەوە: ١. شتنی دانەوێڵە و شتی وا (کە چەن جار شۆردنی پێویسە) ٢. دووبـارە شـتن ٣. *[کینایـە]* لۆمـە کـردن و جـوێن پـێ دان ٤. سـڕینەوە؛ لابـردن ‹دوو بەشـیان لـە کتێبەکـە شـۆردۆتەوە› ☰ ١. شُسـتن حبوبـات و ... ٢. دوبـارە شستن ٣. زیر دُشنام گرفتن ۴. حذف کردن

**شۆرشڤان** / şorişvan/: ☜ **شۆڕشگێڕ**

**شۆرشۆرک** / şorşorik/: نـاو. تافگە؛ تاڤـگە؛ تـاف ☰ آبشار

**شۆرک** / şorik/: ناو. تاڤگە؛ ئاوهەڵدێر ☰ آبشار

**شۆرکە** / şorke/: نـاو. ١. ☜ **شۆتك** ٢. چـەرەس؛ شەوچەرە؛ ئاجیل ☰ ١. ☜ **شۆتك** ٢. آجیل

**شۆرگە** / şorge/: ناو. ١. ☜ **شۆتك** ٢. جلشۆرک؛ جێگـەی جـل شـوتن ☰ ١. ☜ **شـۆتك** ٢. رختشوخانه

**شۆرمەزە** / şormeze/: ناو. نۆکی سوێری کـوڵاو ☰ نخود شور پُخته

**شۆروا** / şorwa/: ☜ **شۆرباو**

**شۆرواڕێژ** / şorwařêj/: ☜ **شۆرباوڕێژ**

**شۆرە**[١] / şore/: نـاو. ١. بارووت ٢. ماکـەی بـاروت ٣. کرێژی سەر ٤. شۆرەکات ‹بە بارانی بەهارانیش زەمینی شۆرە شین نابێ/ لە دەشتی ئێمە هەر شینە، بـە فرمێسـکی ڕەوان چ بکـەم؟ «حـەقیقی»› ☰ ١. باروت ٢. مادەی باروت ٣. شورەی سر ۴. شورەزار

• **شۆرە**[٢]: پاشەوشە. شۆرەوە ‹پلشۆرە› ☰ ـ شور

**شۆرەت** / şoret/: ناو. ١. ناوبانـگ ٢. فامیـل؛ نـاوی بنەماڵەیی ☰ ١. شُهرت ٢. نام خانوادگی

⊡ **شۆرەت داخستن/ دەرکردن**: دەنگ و باسی کەسێ یا شتێ بڵاو بوونەوە ☰ خبر و آوازەی چیـزی یـا کسی همە جا پخش شدن

**شۆرەزار** / şorezar/: ☜ **شۆرەکات**

**شۆرەک**[١] / şorek/: ☜ **شۆرەکات**

**شۆرەک**[٢]: ئاوەڵناو. *[کینایە]* وارونداؤ؛ وەجاخکـوێر؛ بـێ مناڵ ☰ أجاق‌کور

**شۆرەکات** / şorekat/: ناو. شامات؛ شۆراخ؛ شۆرەزار؛ شۆرەک؛ سێلەک: ١. زەوینێ کە بە هۆی خوێی زۆرەوە ڕووەکی تێدا ناڕوێ ٢. *[کینایە]* زەوینێ کـە هیچ بەهرە نادا ☰ ١. شورەزار ٢. زمین بی‌حاصل

**شۆری** / şorî/: ناو. سوێری ☰ شوری

**شۆریاگ** / şoryag/: ☜ **شۆراو**[٢]

**شۆریان** / şoryan/: ☜ **شۆران**

**شۆریاو** / şoryaw/: ☜ **شۆراو**[٢]

**شۆریای** / şoryay/: چاوگ. شـۆردران؛ شـۆریان ☰ شُسته شُدن

**شۆڕین / şořîn/**: ☜ **شۆڕان**

**شۆڕینەوە / şořînewe/**: چاوگ. تێپەڕ. //شۆڕیتەوە؛ دەشۆڕییەوە؛ بشۆڕەوە// شۆڕانەوە؛ شردنەوە؛ شتنەوە ☰ شُستن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەشۆڕینەوە

**شۆڕ[1] / şoř/**: ئاوەڵناو. ١. داهێڵراو؛ داهێزاو ‹لووتی شۆڕ› ٢. درێژتر لە ڕادەی ئاسایی ‹کەوای شۆڕ› ٣. درێژەوە بوو ‹قژی شۆڕ› ☰ ١. فروهشته ٢. دراز ٣. بُلند

◘ **شۆڕ بوون**: درێژتر و داهێزاوتر لە ڕادەی پێویست بوون ‹لووتی شۆڕە› ☰ دراز و فروهشته بودن

**شۆڕ بوونەوە**: شۆڕەو بوون: ١. داهاتنەوە؛ داهێزان ٢. لە بڵندی بەرەوخوار داهاتن * هەروەها: **شۆڕ کردنەوە** ☰ ١. فروهشتن ٢. آویزان شُدن

**شۆڕەو بوون**: ☜ **شۆڕ بوونەوە**

**ـ شۆڕ[2]**: پاشەوشە. ١. بەرز و درێژ ‹پەلکەشۆڕ› ٢. داهێڵراو ‹لووتشۆڕ› ٣. سەرەوخوار ‹سەرشۆڕ› ☰ ١. دراز و بلند ٢. فروهشته ٣. افکنده

**شۆڕاب / şořab/**: ناو. گوێسوانەی گیشەگیا بۆ ئاوەڕۆ دەرکردن ☰ آبریزگاه در تودەی علوفه

**شۆڕابە / şořabe/**: ناو. ١. شەڕابە؛ گولینگەی سەر و پۆری شۆڕەوەبوو ٢. ئاوی بارانی لە سەر بانەوە ڕژاو. هەروەها: **شۆڕابە بەستن** ٣. دیمەنی هەوری بارانڕێژ و داکشاو بەرەو زەوی ‹هەورێک شۆڕابەی بەر داوە/ دەڵێی لە قیریان وەرداوە «هێمن»› ☰ ١. شرابە؛ منگولەی از دور سر آویزان ٢. آب بارانی که از بام می‌ریزد ٣. منظرەی ابر باران‌زا از دور

**شۆڕاو / şořaw/**: ناو. ئاوی باران کە لە بانەوە دەڕژێ ☰ آب بارانی که از بام می‌ریزد

**شۆڕاوگە / şořawge/**: ناو. شۆڕگە؛ جێگەی پێداهاتنی ئاوی بارانە ☰ جای ریزش آب باران

**شۆڕاوە / şořawe/**: ناو. شۆڕە: ١. شۆڕابە؛ گولینگەی شۆڕی سەروپێچ ‹قەسەم بە دیدەی غەزالت/ شۆڕاوەی گولەنگ و دەسماڵت/ لە بەر خەڵکی نایمە ماڵت «فولکلۆر»› ٢. پەرەنگی گوارە ٣. ئاوی باران کە لە بانەوە دەڕژێ ٤. دۆخی لە شوێن یەکەوە ڕیز بەستن ‹ڕانەکە شۆڕاوەی بەستگە› ☰ ١. شرابە ٢. آویزەی گوشوارە ٣. آب بارانی که از بام می‌ریزد ۴. حالت به صف شدن

**شۆڕش / şořiş/**: ناو. ١. ڕاپەڕینی کۆمەڵ ٢. کێشە و هەرا و ئاژاوە ☰ ١. انقلاب ٢. شورش

**شۆڕشڤان / şořişvan/**: ☜ **شۆڕشگێڕ**

**شۆڕشگێڕ / şořişgêř/**: ئاوەڵناو. شۆڕشڤان؛ شۆڕشڤان؛ شۆڕشوان؛ خەباتگێڕ؛ لایەنگری شۆڕش؛ بەشدار لە ڕاپەڕینی گەل دژی دەسەڵاتدار ☰ انقلابی

**شۆڕشوان / şořişwan/**: ☜ **شۆڕشگێڕ**

**شۆڕشۆڕک / şořşořik/**: ناو. تافگە؛ ئاوهەڵدێر ☰ آبشار

**شۆڕگە / şořge/**: ☜ **شۆڕاوگە**

**شۆڕە[1] / şoře/**: ☜ **شۆڕاوە**

**شۆڕە ـ[2]**: پێشوشە. ١. جوانچاک ‹شۆڕەژن› ٢. چەلەنگ؛ زرنگ ‹شۆڕەسوار› ٣. داهێڵراو ‹شۆڕەبی› ☰ ١. زیبا ٢. چالاک ٣. آویزان

**ـ شۆڕە[3]**: پاشەوشە. داشۆڕاو؛ داهێڵراو ‹چلمەشۆڕە؛ گونەشۆڕە› ☰ آویزان

**شۆڕەبی / şořebî/**: ناو. شەنگەبی؛ شینەبی؛ جۆرێ دار بی کە لقەکانی شۆڕ دەبنەوە ☰ بید مجنون

**شۆڕەتوو / şořetû/**: ناو. جۆرێ دارە توو کە لقەکانی سەر بەرەو خوار چەماون ☰ توت مجنون

**شۆڕەژن / şořejin/**: ناو. ژنی جوان و بەحورمەت ☰ زن زیبا و باوقار

**شۆڕەسوار / sores(i)war/**: ئاوەڵناو. چاپکسوار؛ سووکەڵە سوار ☰ چابکسوار

**شۆڕەشۆڕ** / soreşoř/: ☜ شورەشور

**شۆڕەلاو** / şořelaw/: ناو. لاوی جوانچاک ☰ جوان رعنا

**شۆڕەنەمام** / şořenemam/: ناو. *[کینایە]* لاوی جوانچاک ☰ جوان رعنا

**شۆڕەوبوگ** / şořewbûg/: ☜ شۆڕەوەبو

**شۆڕەوەبو** / şořewebû/: ناو. شۆڕەوبووگ؛ داهاتوو؛ داهێڵدراو ☰ فروهشته

**شۆڕەوەکراو** / şořewek(i)raw/: ئاوەڵناو. داڵووچکە؛ لەقاو؛ داهێڵڕاو ☰ فروهشته

**شۆز** / şoz/: ناو. سۆز؛ سۆژ ☰ سوز

**شۆستە** / şoste/: ناو. شۆسە؛ ڕێگەی خۆشکراو ☰ راه شوسه

**شۆسە** / şose/: ☜ شۆستە

**شۆش**[١] / şoş/: ناو. ١. بیر و هۆش ٢. تاڤگە؛ ئاوهەڵدێر ☰ ١. هوش ٢. آبشار

**شۆش**[٢]: ئاوەڵناو. شاش؛ بەهەڵەچوو ☰ گُمراه

**شۆش**[٣]: دەنگ. هۆش؛ وەوش؛ چۆش؛ وشەی ڕاوەستاندنی کەر و ئێستر ☰ هُش

**شۆشی** / şoşî/: ناو. سی؛ سهی؛ سیپەلاک ☰ شُش

**شۆشبان** / şoşban/: ناو. برازاوا ☰ ساقدوش

**شۆفار** / şofar/: ☜ شوفار

**شۆفاری** / şofarî/: ☜ شوفاری

**شۆفاژ** / şofaj/: ☜ شوفاژ

**شۆفێر** / şofêr/: ناو. شووفر؛ ئاژۆ؛ هاژۆ؛ ئاژوەر؛ هاژۆر؛ داژوێنەر؛ ڕانبار؛ سەیاق؛ لێخوڕە؛ ڕانندە؛ کەسێ کە کەرەسەیەک ـ بەتایبەت ماشێن ـ بەڕێوە دەبا ☰ راننده

**شۆڤ** / şov/: ناو. شێو؛ کێڵدراو ☰ شُخم

**شۆق**[١] / şoq/: ناو. ١. شەوق؛ تیشک؛ ڕووناکی چرا و ئاگر و مانگەشەو ٢. شەوق؛ گەشە و تێراوی ٣. کەیفخۆشی؛ دڵشادی ٤. کاری بە سەر تێهەڵدانی حەیوان ‹شەڕە شۆق› ☰ ١. پرتو ٢. شادابی ٣. شادمانی ۴. عمل با کله ضربه زدن حیوان

⊡ **شۆق تێهەڵدان:** شۆق لێدان؛ لێدانی حەیوان بە کەللە ☰ ضربه زدن حیوان با کله

**شۆق دان:** ١. بریقەدان ٢. تیشک دان ٣. کەللە لێ دانی حەیوان ☰ ١. برق زدن ٢. درخشیدن ٣. با کله ضربه زدن حیوان

**شۆق دانەوە:** تیشک گەڕاندنەوە؛ تیشک دانەوە ☰ انعکاس دادن نور

**شۆق لە تەپاڵە سەندن:** *[پلار]* زۆر ناحەز و دزێو بوون ☰ بسیار زشت بودن

**شۆق لێدان:** ☜ شۆق تێهەڵدان

**شۆق وەشاندن:** ☜ شۆق هاویشتن

**شۆق هاویشتن:** شۆق وەشاندن؛ شۆق هەڵدان؛ سەر وەشاندنی بڕێ چوارپێ وەک کەڵ و بەران لە کاتی شەڕدا ☰ با کله ضربه زدن حیوان

**شۆق هەڵدان:** ☜ شۆق هاویشتن

**شۆق**[٢]: ئاوەڵناو. سست؛ شل؛ بە بێ پتەوی پێویست ☰ سُست

**شۆقاڤ** / şoqav/: ناو. چڵپاو؛ حەڕی و لیتە ☰ گِل و لای

**شۆقدار** / şoqdar/: ئاوەڵناو. ١. بەتیشک و بریقە ٢. بە گەشە و تێراو ☰ ١. درخشان ٢. شاداب

**شۆقل** / şoqil/: ناو. کشۆل: ١. پۆلکە؛ گاگۆر ٢. پۆرگ؛ بلۆق ☰ ١. گیاه خُلّر ٢. تاول

**شۆق و شەبەق** / şoq û şebeq/: ناو. تیشک و دۆخی تیشک دانەوە ☰ درخشش و انعکاس پرتو

**شۆقوەشێن** / şoqweşên/: ☜ شۆقهاوێژ

**شۆقهاوێژ** / şoqhawêj/: ئاوەڵناو. شۆقوەشێن؛ تایبەتمەندی حەیوانێ کە بە سەر دە خەڵک هەڵدەدا ☰ کله‌زن

**شۆک** / şok/: ناو. شۆکە: ١. گەزۆی مازوو ٢. شۆبە؛ بەلایەکی درەختە ٣. دۆشاوی ترێ ٤. دۆک؛ دۆکە؛ بەلایەکی گەلای مێوە، سپی

هەڵدەگەڕێ ٥. *[پزشکی]* دۆخـی شـێوانی ڕەوتی خوێنگەڕان بە هۆی گەزنـد یـان نەخۆشـییەکی ئاستەمەوە کە دەبێتە هـۆی دابـەزینی پەسـتانی خـوێن، دڵـەتەپە، ڕەنـگ پـەڕین، بـێئـۆقرەیی، تینوویەتی، سـاردی پێسـت و... ☰ ١. گـزانگبین درخت مازوج ٢. شـته ٣. شـیرەی انگـور ٤. سـپیدک برگ مو ٥. شوک

⊡ **شۆک پێ/ لێ دان:** پێکهێنانی شۆک لە لەشـی گیانداردا ☰ شوک دادن

**شۆکنایۆ** / şoknayo/: چاوگ. شەکاندنەوە ☰ تکان دادن

**شۆکنایەوە** / şoknayewe/: چاوگ. شەکاندنەوە ☰ تکان دادن

**شۆکە**[1] / şoke/: ناو. ١. ☜ **شۆک** ٢. کاری یەکجار شـتن ٣. دۆکـە؛ دوەک؛ سـپیاتی ئـارەق بـە جلوبەرگەوە ☰ ١. ☜ **شـوک** ٢. عمـل یـک بـار شُستن ٣. شورەی عرق

**شۆکە**[2]: ئاوەڵـناو. داچڵـەکاو؛ داخورپـاو؛ تووشـیاری شۆک ‹شۆکە بووم› ☰ شوکّە

**شۆکەران** / şokeran/: ☜ **شەوکەران**

**شۆکیایۆ** / şokyayo/: چـاوگ. شـەکانەوە ☰ تکـان خوردن

**شۆکیایەوە** / şokyayewe/: چـاوگ. شـەکانەوە ☰ تکان خوردن

**شۆل**[1] / şol/: ناو. شـوغڵ؛ پیشـە؛ کـار ‹شۆلـا فـی شفانییە› ☰ شغل

**شۆل**[2]: ئاوەڵناو. ١. سوێر؛ سوور؛ شـۆر ٢. چـەور ٣. ناتەکووز و بێسـەرەوبەرە ☰ ١. شـور ٢. چـرب ٣. نامُرتّب

**شۆلاڤ** / şolav/: ناو. شێوی زۆر چەور؛ چێشتی پڕ لە ڕۆن ☰ آش بسیار چرب

**شۆلاو** / şolaw/: ناو. سوێراو؛ خوێاوک؛ ئاوی خوێ تێکەلاو ☰ آب شور

**شۆلاوگە** / şolawge/: ناو. شوێنی کۆ بوونەوەی ئاو یان خوێن ☰ محل جمع شدن آب یا خون

**شۆلتاڤ** / şoltav/: ناو. چێشتی شلەی کەم دان ☰ آش کم دانه

**شۆلک** / şolik/: ناو. ١. تاینچە؛ تایچـە؛ ڕەشـکەی دوو تایی بۆ کاکێشـان ٢. مـاش؛ ماشـە؛ جـۆرێ دانەوێڵە ☰ ١. تور دوتایی کاهکشی ٢. ماش

**شۆلە** / şole/: ناو. تێر؛ شوولە؛ جەواڵی دووتایی ☰ جوال دوتایی

**شۆلەکە** / şoleke/: ☜ **شولەکە**

**شۆڵ** / şoł/: پێرۆ. ← **شلوشۆڵ**

**شۆڵە**[1] / şołe/: ناو. ١. شوعلە؛ تیشـکی ئـاگر ‹شـۆ جانفدایی جە پەروانە گیر/ پەروا نەدارۆ جـە شۆڵـەی ئایر «بێسـارانی»› ٢. تیرئەسـتێرە ☰ ١. شُـعلە ٢. شهاب

**شۆڵە**[2]: ئاوەڵناو. تراو؛ شل ☰ آبکی

**شۆم** / şom/: ناو. شـوو؛ شـێف؛ شـێو؛ شـێوەرد؛ کێڵدراو؛ جووت لێکراو ☰ **شُخم**

**شۆن**[1] / şon/: ناو. ١. شوێن؛ دوا؛ پـاش ‹نـە دڵـەی پرزەوق کۆنە نەچیردا/ های لەزەت دارۆ تیر وە شـۆن تـیردا «مەولـەوی»› ٢. شـوێن؛ شـۆب؛ شـۆپ ‹ڕۆیشت و شۆنـی نـەما› ٣. جێگـە؛ شـوێن ‹ئـەم شۆنە خالییە› ☰ ١. دنبال ٢. رد؛ اثر ٣. جا؛ مکان

⊡ **شۆن گوم کردن:** شۆپ وندا کرن ☰ رد گُم کردن

**شۆن نیـان:** شۆپ هەڵگرتن؛ بە دوادا گـەڕیان ☰ رد گرفتن؛ تعقیب کردن

**شۆن**[2]: پێرۆ. ← **شەرتوشۆن**

**شۆنک** / şonik/: ناو. سوێنەی جل تێـدا شـوتن ☰ تشت رختشویی

**شۆنکەوتی** / şonkewtî/: ناو. کاری کەوتنە شـوێن ☰ عمل تعقیب کردن

**شۆنگومەکێ** / şongumekê/: ☜ **شوێنگومەکێ**

**شـۆنە** / şone/: ئاوەڵـناو. سـەراو؛ ئاوەسـەر؛

تایبەتمەندی زەوینێ کە درەنگ ئاو دەخواتەوە ☰ ویژگی زمینی کە دیر آب را جذب می‌کند

**شۆنەما / şonema/**: ناو. ١. شوێنهات؛ شۆنهات؛ کاردانەوە؛ ڕووداوێک کە لە ئاکام یا بە هۆی کار یا دیاردەیەکەوە پێک دێ ٢. ☜ **شوێنەوار ـ ١** ☰ ١. پیامد ٢. ☜ **شوێنەوار ـ ١**

**شۆنەوار / şonewar/**: ☜ **شوێنەوار**

**شۆنهات / şonhat/**: ☜ **شۆنەما ـ١**

**شۆو / şow/**: ناو. شێو؛ شێف ☰ شُخم

**شو / şû/**: ناو. ١. شووی؛ شی؛ مێردی ژن ٢. شان؛ شان و مل ٣. خەرپشتە؛ بانی بە تاق و لە خشت ٤. شڤ؛ تووڵ ٥. هەنگوینی نەپاڵێوراو ٦. شێف؛ شێوەرد ٧. زەوی کێڵدراو ☰ ١. شوهر ٢. کِتف ٣. طاق خشتی ٤. ترکە ٥. عسل با موم ۶ شُخم ٧. زمین شُخم‌زده

⊡ **شو بڕین**: ١. کێلانی زەوی؛ گاسن لێدانی زەوی ٢. تووڵ بڕین ☰ ١. شُخم زدن ٢. ترکە بُریدن

**شو دان**: دانە شوو؛ بە شوو دان؛ بە مێرد دان ☰ شوهر دادن

**شو کردن**: شووی کرن؛ شی کردن؛ مێرد کردنی ژن ☰ شوهر کردن

**شو لێ هەڵکێشان**: /کینایە/ بێ‌حەیایی و ڕوو هەڵماڵینی لە ڕادەبەدەر نواندن ‹بە جارێ بووە بە کەلەگا و شووی لێ هەڵکێشاوە› ☰ بی‌شرمی و پُررویی را از حد گذراندن

**شوبرا / şûb(i)ra/**: ناو. هێوەر؛ برای مێرد ☰ برادر شوهر

**شوبراژن / şûb(i)rajin/**: ناو. هێوەرژن؛ هاوگیان؛ هۆمبی؛ براژنی مێرد ☰ جاری؛ زن برادر شوهر

**شوت[١] / şût/**: ناو. ١. درۆی هەڵبەستە ٢. دارووکەی سەرتیژ لە یاری منالاندا کە دەیهاوێن و دەچەقێ ٣. مشتی ئاوالە لە یاری منالاندا ٤. شەپ؛ کاری تێهەڵدانی تۆپ ٥. فیتوو؛ فیکە؛ فیقە ☰ ١. گزاف ٢. چوبک نوک تیز بازی کودکان ٣. مُشت باز در بازی کودکان ۴. شوت ۵. سوت

⊡ **شوت کردن**: شەق لە تۆپ هەڵدان ☰ شوت زدن

**شوت[٢]**: ئاوەڵناو. ١. حولی؛ لووس و ساف ٢. زرنگ؛ وشیار؛ بزێو ☰ ١. صاف و هموار ٢. هوشیار

**شوتانێ / şûtanê/**: ناو. شووتبازی؛ کاری داروکە هاویشتن و چەقاندن ☰ از بازی‌های کودکان

**شوتبازی / şûtbazî/**: ☜ **شوتانێ**

**شوتک / şûtik/**: ☜ **شویتك**

**شوتگ / şûtig/**: ☜ **شیتك**

**شوتن / şûtin/**: ☜ **شۆردن**

**شوتو / şûtû/**: ☜ **شوتی**

**شوتە / şûte/**: ناو. ١. قسەی هەڵبەستە ٢. ☜ **شویت** ☰ ١. گزافە ٢. ☜ **شویت**

**شوتی / şûtî/**: ناو. شۆتی؛ شامی؛ شبتی؛ شتی؛ شفتی؛ شمتن؛ شمتی؛ شمستی؛ شەبەز؛ شەبەژ؛ شەبەش؛ شوومی؛ شمتوو؛ شیتوو؛ شووتوو؛ سمتوو؛ سمتن؛ سمتی؛ هەنی؛ هەننی؛ هەندی؛ هەنگی؛ هەینی؛ هندی؛ هیندوویی؛ جەبەش؛ زەبەش؛ زەربەش؛ جەبەژ؛ ژەبەش؛ زەبەز؛ ژەبەژ: ١. شەتلە گیایێ لە تیرەی خەیار، بە گەڵای شەقار ـ شەقار، لاسکی خەوتوو، گوڵی زەرد و میوەی ئاوداری خۆراکییەوە ٢. میوەی خڕی ئەو گیایە بە توێکڵێکی ئەستووری سەوز، گۆشتی سوور یان زەردی شیرین و ئاودارەوە کە دەنکەکانی تێیدا بڵاون ☰ ١و٢. هندوانە

⊡ **شوتی وە بن هەنگڵ کەسێ دان**: /کینایە/ پێدا هەڵگوتن بۆ فریو دان ☰ هندوانە زیر بغل کسی گذاشتن

**شوتی‌بڕکێن / şûtîbiřkên/**: ناو. یارییەکە بە شووتی دەکرێ، هەر کەس و شووتییەک تالار

دەکاتەوە، هی هەر کەس زۆرتر بڕوا و نەشکێ، شووتییەکانی تر دەبا بۆ خۆی ☰ نوعی بازی با هندوانه

**شوتیەدار** / şût(i)yedar/: ناو. گەز؛ گز؛ گزچار؛ گزم؛ گزیچار؛ دار گەزۆ ☰ درخت گز

**شووتییەکۆڵە** / şûtîyekołe/: ناو. زەبەشی چکۆلەی گەیشتوو ☰ هندوانەی کوچک رسیده

**شوخاڵ** / şûxał/: ناو. شووش؛ شوێنی توول و شەلاخ لە سەر پێست ‹وای بە توول لێ داوە، شووخاڵی هەستاوە› ☰ جای ترکه و تازیانه بر پوست

**شوخوشک** / şûxuşk/: ناو. دش؛ دوش؛ شاباجی؛ خوشکی شوو ☰ خواهرشوهر

**شودار** / şûdar/: ئاوەڵناو. بەشوو؛ بەمێرد؛ شوودارە؛ شووکردوو ‹ژنی شوودار› ☰ شوهردار؛ مُتأهل (برای زن)

**شوودارە** / şûdare/: ☜ **شودار**

**شوداری** / şûdarî/: ناو. لێوەشاوی و لێهاتوویی ژن بۆ پێڕاگەیشتن بە شوو ☰ شوهرداری

**شور**[١] / şûr/: ناو. ١. ☜ **شیر-٢** ٢. شقر؛ فیلەگێژە؛ جۆرێ کەڵەکێوی ☰ ١. ☜ **شیر-٢** ٢. نوعی کل کوهی

**شور**[٢]: ئاوەڵناو. سوێر؛ سۆڵ؛ شۆر ☰ شور

**شورا** / şûra/: ناو. ١. ☜ **شورە-١** ٢. ☜ **شۆرا**

**شورک**[١] / şûrik/: ناو. ١. شمشێرە؛ دەستەندوی هەوجاڕ ٢. پلووسک؛ پلوورە؛ ئاوپەڕ ☰ ١. دستگیرەی خیش ٢. ناودان

**شورک**[٢]: ئاوەڵناو. خوار و خێچ ☰ کجوکوله

**شورگەر** / şûrger/: ناو. شیرگەر؛ وەستای شیر و خەنجەرساز ☰ شمشیرساز

**شوروارێژ** / şûrwařêj/: ناو. دۆغاو؛ دۆخاو ☰ دوغاب

**شورە** / şûre/: ناو. ١. شوورا؛ سوور؛ وارش؛ دیوار بە دەوری ماڵ و باغ و بێستاندا ٢. شوورەیی؛ عەیب و عار ☰ ١. حصار ٢. ننگ و عار

**شورەیی**[١] / şûreyî/: ناو. عەیب؛ نەنگ؛ شوورە ‹خێڵێکی سەیرن، لە شەرم و شوورەیی ناپرسن› ☰ ننگ؛ عار

**شورەیی**[٢]: ئاوەڵناو. شەرمهێن؛ دزێو ‹کاری شوورەیی› ☰ زشت

**شورهەنگێو** / şûrhengêw/: ناو. شیروەشێنی کارامە و کردە ☰ شمشیرزن ماهر

**شوریان** / şûryan/: چاوگ. شێوان؛ شێویان ☰ بە هم ریختن

**شوز** / şûz/: ناو. ١. جغز؛ جەغز؛ دایرە ٢. چووز؛ خەتی لە سەر وێستان بۆ هاویشتنی مت بۆ ناو جغز لە کایەی جغزێندا ☰ ١. دایرە ٢. خط نشانەگیری در یکی از بازی‌ها

**شوژ** / şûj/: ناو. ورتکەبەردی بە کوتک شکێنراو ☰ ریزه سنگ شکسته

**شوژن** / şûjin/: ناو. سووژن ☰ جوالدوز

**شوژناژن** / şûj(i)najin/: ناو. سووژناژن؛ کاری بە سووژن کون ـ کون کردن ☰ عمل با جوالدوز سوراخ-سوراخ کردن

**شوژی** / şûjî/: ناو. ١. ژووژوو؛ ژووژی؛ ژووشک؛ ژیشک ٢. تیژاوی پەنیر ☰ ١. جوجەتیغی ٢. تیزاب پنیر

**شوسەوە** / şûsewe/: ناو. توولی سەبەتەچنی ☰ ترکەی سبدبافی

**شووش**[١] / şûş/: ناو. ١. چووزە؛ لقی یەکساڵانی تەڕ و نەرمی دار ٢. ☜ **شوخاڵ** ☰ ١. شاخەی نرم یکسالەی درخت ٢. ☜ **شوخاڵ**

⊡ **شوش کردن**: لقی نەرم و تازە دەرکردنی دار ☰ شاخه‌های نرم و تازه رویاندن درخت

**شووش**[٢]: ئاوەڵناو. ١. قەدباریک ٢. بالاجوان ‹چ یارێ، یاری دڵبەر بێ، جوان و شووش و ئەسمەر بێ/ دەبێ هەمتایی ئەختەر بێ، وەکوو ئاهوویی سەحرا بێ

«ویسالی»› ☰ ١. باریک اندام ٢. خوش قد و قامت

**شوشبان** / şûşban/: ☜ **شوشبین**

**شوشبین** / şûşbîn/: ناو. شووشـبان؛ بـرازاوا ☰ ساقدوش

**شوشتەری** / şûşterî/: ناو. یـەکێ لـە نەغمـەکانی دەزگای مۆسیقای ئێرانی ☰ نغمەی شوشتری

**شوشک** / şûşik/: نـاو. سووسـک؛ سووسـکە؛ سوێسکە ☰ تیهو

**شوشکە** / şûşke/: ناو. بـاتوون؛ شـیری کـورت ☰ شمشیر کوتاه

**شوشە** / şûşe/: ناو. شیشە؛ شیشێ؛ شوویشە؛ مینا؛ جام؛ وەنەدیک؛ گزگزە: ١. ماکێکی ڕەق، تورت و بێبیچمە و لە سروشتدا بەدی دێ ٢. ڕووپەڕێکی ڕێک لەو جنسە کە بۆ دابین کردنی ڕووناکی لـە سەر دەلاقە و ڕۆچن دایدەنێن ‹شووشەی دەلاقـە؛ شووشەی ماشین› ٣. دەفرێ لەو ماکە بۆ پاراستن و ڕاگرتنی شتێک ‹شووشەی عەتر؛ شووشەی دەوا› ٤. ئامرازێکی درووسکراو لەو ماکە ‹شووشەی چرا؛ شووشەی چاویلکە› ☰ ١تا٤. شیشە

▣ **شوشەی تەمەن**: *[مەجاز]* گیان؛ هەوێنی ژیـان ☰ شیشەی عمر

**شوشەبڕ** / şûşebiř/: ناو. شیشەوڕ: ١. شووشەکار؛ جامچی ٢. ئامرازی شووشە بڕین ☰ ١. شیشەبُر ٢. ابزار شیشەبُری

**شوشەبەن** / şûşeben/: ☜ **شوشەبەند**

**شوشەبەند** / şûşebend/: ناو. شووشـەبەن؛ ژوورێ کە دیواری لە جام کراوە ☰ شیشەبند

**شوشەچرا** / şûşeç(i)ra/: ناو. شیشەچرا؛ شووشـەی چرا لامپا ☰ شیشەی لامپا

**شوشەخۆر** / şûşexor/: ناو. شیشەخۆر؛ ئـەو بەشـە لە ڕووکاری دەلاقە، درگا و ... کە شووشەی تـێ دەخەن ☰ شیشەخور

**شوشەسازی** / şûşesazî/: نـاو. شیشەسـازی؛ کارگەی دروست کردنی شووشە ☰ شیشەسازی

**شوشەسۆل** / şûşesol/: ☜ **شوشەسەهۆڵ**

**شوشەسەهۆڵ** / şûşesehoł/: نـاو. چلـووره؛ شووشەسۆل؛ شووشەیەخ ☰ دنگالە

**شوشەشیر** / şûşeşîr/: ناو. شیشەشـیر؛ بوتڵـێکی چکۆلە بە مەمکەمژەوە بۆ شیردانی منداڵی سـاوا ☰ شیشەی شیر

**شوشەکار** / şûşekar/: ☜ **شوشەبڕ-١**

**شوشەگەر** / şûşeger/: ناو. شیشەگەر؛ پیشەگەری نێو شووشەسازی؛ کەسێ کە جام دروسـت دەکـا ☰ شیشەگر

**شوشەیەخ** / şûşeyex/: ☜ **شوشەسەهۆڵ**

**شوشەیی** / şûşeyî/: ئاوەڵناو. شیشەیی؛ دروستکراو لە شووشە ☰ شیشەای؛ از جنس شیشە

**شوفار** / şûfar/: ئاوەڵناو. شوفار؛ شۆفار؛ شۆڤـار: ١. زمانشڕ؛ نێوانتێکدەر ٢. جاسـووس؛ سـۆزمانی؛ زوانگر ☰ ١. سُخنچین ٢. جاسوس

**شوفاری** / şûfarî/: نـاو. شـۆفاری؛ زیـرانی؛ جاسووسی ☰ جاسوسی

**شوفاژ** / şûfaj/: نـاو. شـۆفاژ: ١. سیسـتەمی گەرمادەری ناوەندی بە خەزێنە و تـۆڕی لوولـە و ڕادیاتۆرەوە ٢. هەر یەکە لـە ڕادیاتۆرەکـانی ئـەو دەزگایە ☰ ١و٢. شوفاژ

**شوفاژخانە** / şûfajxane/: نـاو. هـۆدەی شـوێنی دەزگای گەرمکەری ناوەندی ☰ شوفاژخانە

**شوفر** / şûfir/: ☜ **شۆفێر**

**شوڤال** / şûval/: ناو. جۆرێ شێوی خەڵکی جزیـر و بۆتانە ☰ نوعی آش محلی

**شوڤک** / şûvik/: نـاو. ١. ئالقەڕێز و دوولایی دەرگا ٢. *[کۆن]* وشتر؛ حوشتر ☰ ١. حلقە و لـولای در ٢. شُتر

**شوڤکڤان** / şûvikvan/: ناو. وشترەوان؛ سـارەوان ☰ ساربان

**شوڤی** / şûvî/: ناو. وِنار؛ دووهێشه؛ کاری کـێلانی چەند گاسنە ☰ شُخم مُجدد

**شوکا** / şûka/: ناو. ١. گەوەزنـە گرگنـە؛ جۆرێـک کەلەکێوی بچووکی کولۆک سپی و کلکدرێژ ٢. شەمکۆر؛ جۆرێـک ئاسـکی یـەک سالـە وێنـەی بزنـەکێوی ٣. فیلـەگێژە؛ شـوول؛ جۆرێـک کەلەکێوی کلـک کـورتی خۆلەمێشـی ☰ ١تا٣. شوکا

**شوکراو** / şûk(i)raw/: ناو. وەرد؛ شوێنی کێلـدراو ☰ زمین شخمزده

**شـوکردو** / şûkirdû/: ئاوەڵـناو. ١. شـووکردگ؛ خـاوەن شـوو؛ شـوودار ٢. *[کنایه]* پێگەیشـتوو؛ عازەب (ژن) ☰ ١. شوهردار ٢. بالغ (زن)

**شوکە** / şûke/: ☜ **شوڵ**

**شوگەر** / şûger/: ☜ **شیرگەر**

**شوڵ** / şûl/: نـاو. ١. ☜ **شوغڵ** ٢. پیسـایی شـل ٣. خلێـره؛ گـاگۆز؛ پۆلـکه ☰ ١. ☜ **شـوغڵ** ٢. مدفوع آبکی ٣. گیاه خُلّر

**شولاندن** / şûlandin/: چاوگ. فیڕاندن؛ زگچوون ☰ اسهالی ریدن

**شولک** / şûlik/: ☜ **شوڵ**

**شولکاندن** / şûlkandin/: چاوگ. *[پلار]* خۆ لە کـار دزینەوە ☰ جیم شدن

**شولکەر** / şûlker/: ناو. کارگەر؛ کرێکار ☰ کارگر

**شـولگ** / şûlig/: نـاو. شـتزۆری؛ فـەرحانی ☰ فراوانی

**شولە** / şûle/: ناو. ١. جەوالی؛ تێر ٢. گیای دەلاو بـە گـەورەیی و هەراشـی ☰ ١. جـوال دوتـایی ٢. گیاهی است

**شـولەکە** / şûleke/: نـاو. شـۆلەکە؛ خـورجێن؛ هەگبە؛ تێر ☰ خورجین؛ جوال دوتایی کوچک

**شولەم** / şûlem/: ناو. *[پلار]* زک؛ ورگ ☰ شکم

**شـولین** / şûlîn/: ناو. تەڤژین؛ بەلەفیره؛ زگەشـۆره؛ زگچوون ☰ اسهال

**شوڵ** / şûł/: نـاو. شوولک؛ شوولک؛ شوو؛ شـووکە؛ توول؛ شۆڵ؛ لکی باریک ☰ ترکەی باریک

**شوڵک** / şûłik/: ☜ **شوڵ**

**شوم** / şûm/: ئاوەڵناو. شوم؛ جووتقۆشـە؛ بـێفـەڕ ‹کوندی شوومی شەڕ› ☰ نحس؛ شوم

**شوماسی** / şûmasî/: ناو. جەلـد؛ لیزگەماسـی بـە شوولکەوە کراو ☰ رشتەی ماهی در ترکه شده

**شومی** / şûmî/: ناو. ١. بەدفـەڕی ‹چقلـی مـەزاری مـن چەقییـە دامـەنی، چ سـوود/ شـوومی بـەرۆکی بەختمی بەردا کـە مـن نـەمام «مـەحوی»› ٢. ☜ **شوتی** ☰ ١. نحوست ٢. ☜ **شوتی**

**شـــومیشـــەیتـــونی** / şûmîşeytûnî/: ☜ **کاڵەکەمارانە ـ١**

**شون** / şûn/: ☜ **شوێن**

**شوندیاری** / şûnd(i)yarî/: ناو. قـەرەبووی دیـاری بە دیاری ☰ هدیەی در جواب هدیه

**شونگر** / şûngir/: ناو. بریکار؛ وەکێل ☰ وکیل

**شوی** / şûy/: ☜ **شو ـ١**

▣ **شوی کرن**: ☜ **شو کردن**

**شویتەمارانە** / şûytemarane/: نـاو. خـەیاردێمی؛ کاڵەکەمارانە ☰ هندوانەی ابوجهل

**شویشە** / şûyşe/: ☜ **شوشە**

**شـویل** / şûyl/: نـاو. کلـۆش؛ لاسـکی دەخـڵ ☰ ساقەهای غلّە

**شوین** / şûyn/: ☜ **شوێن**

**شویەم** / şûyem/: ☜ **شێف**

**شە**[1] / şe/: ناو. ١. شانەی سەر داهێنان ٢. شـانەی کولکە ٣. شەن؛ شـەنە ٤. کەلـکیت؛ کـەرکیت؛ دەف؛ دەفـە؛ هـەپک؛ هـەپۆ؛ هەپـە؛ کـارازا؛ ئامرازێکی کانزایی و قورس بۆ کوتانـەوەی پـۆ ٥. نم؛ تەڕایی ☰ ١. شانەی سر ٢. شانەی پشمصافکن ٣. چارشاخ؛ افشون ٤. دفته ٥. نم

**شه**[٢]: ناوەڵناو. کۆن؛ بێ‌ڕەمێن؛ لە نرخ کەوتوو ☰ قدیمی؛ از رواج افتاده

⊡ **شه بون:** کۆن بوون؛ لە نرخ کەوتن ☰ کهنه شدن

**شەب** / şeb/: ناو. زاخ ☰ زاج سفید

**شەباب** / şebab/: ناو. شەبابە؛ شمشاڵ؛ بلوێری کانزا ☰ نی فلزی

**شەبابە** / şebabe/: ☜ **شەباب**

**شەباقە** / şebaqe/: ناو. دەلاقەی کوناودیو لە دیوار بۆ ڕووناکی ☰ روزنه (در دیوار)

**شەباک** / şebak/: ناو. ١. ڕەوتی تیشک دانەوە ٢. ☜ شەبەك ـ١و٢ ☰ ١. درخشش ٢. ☜ **شەبەك ـ١و٢**

**شەبخان** / şebxan/: ناو. شاقەڵ؛ داوێن و گۆشەی کەوا ☰ دامن کُت و عبا

**شەبدەر** / şebder/: ☜ **شەوەر**

**شەبدێز** / şebdêz/: ☜ **شەودێز**

**شەبسان** / şebsan/: ☜ **شەبستان**

**شەبستان** / şebistan/: ناو. شەبسان؛ شەوسان: ١. ئۆدەی گەورە بۆ دانیشتن لە ماڵ ٢. ناوماڵی مزگەوت ☰ ١و٢. شبستان

**شەبقە** / şebqe/: ☜ **شەبکە**

**شەبک** / şebk/: ناوەڵناو. تۆزێک شەل لە ڕێ کردنا ☰ کمی لنگ

**شەبکان** / şebkan/: چاوگ. ئێشان؛ ژان کردن ☰ درد کردن؛ به درد آمدن

**شەبکاندن** / şebkandin/: چاوگ. ئێشاندن ☰ به درد آوردن

**شەبکە** / şebke/: ناو. شەبقە؛ شەپقە؛ شەپکە؛ کڵاوی بە لێوارە ☰ کُلاه لبه‌دار

**شەبکین**[١] / şebkîn/: چاوگ. ١. شەلینی کەم ٢. ڕەق بوونی ماسوولکەی لەش ٣. ئێشان؛ هاتنە ئێش ☰ ١. لنگیدن جزئی ٢. مُنقبض شدن عضلات بدن ٣. درد گرفتن

**شەبکین**[٢]: ناو. نەخۆشییەکی ئاژەڵە کە شەلی دەکا ☰ نوعی بیماری دام

**شەبلوک** / şeblûk/: ناو. چەڵتووک ☰ شلتوک

**شەبۆت** / şebot/: ناو. ١. درێژترین ماسوولکەی لەشی گیانەوەر ٢. جۆرێک ماسییە ☰ ١. بلندترین عضُلەی بدن جانور ٢. گونەای ماهی

**شەبەز** / şebez/: ☜ **شوتی**

**شەبەژ** / şebej/: ☜ **شوتی**

**شەبەش** / şebeş/: ☜ **شوتی**

**شەبەق** / şebeq/: ناو. ١. ڕۆشنایی ئاسۆ ٢. گزنگ؛ تیشکی سەرەتایی هەتاو ٣. کون لە دیوار و کووتاڵدا ☰ ١. شفق ٢. نخستین تابش آفتاب ٣. سوراخ در دیوار و پارچه

⊡ **شەبەق تێبون:** ☜ **شەبەق تێکەوتن**

**شەبەق تێکەوتن:** شەبەق تێبوون؛ کونا بوونی دیوار و کووتاڵ ☰ سوراخ شدن دیوار یا پارچه

**شەبەق دان:** گزنگ لێ دان؛ زەردە لە کێوان دان؛ هەوەڵ تیشکی تاو لە شتێک دان ☰ نخستین تابش آفتاب به جایی زدن

**شەبەق دانەوە:** کەوانە کردنەوەی تیشکە ☰ مُنعکس شدن پرتو

**شەبەق ــ شەبەق** / şebeq şebeq/: ناوەڵکار. کون-کون ☰ سوراخ ـ سوراخ

**شەبەقی** / şebeqî/: ناو. شەوەکی؛ بوولێڵەی بەیان؛ بەرەبەیانی زوو ☰ پگاه؛ اوّل بامداد

**شەبەک** / şebek/: ناو. ١. شەباک؛ قەلادەی ملی تاژی و ورچ و ... ٢. شەباک؛ پەنجەرەی تێلی سەر چاک و پیران ٣. جۆرێ مەیمون ٤. نهێنی خۆماڵی ناو دەرویشان ٥. تیرەیەکی کوردن بە زاراوە و ئایینی تایبەتی خۆیانەوە ☰ ١. قلاده ٢. شباک سر مزار ٣. نوعی میمون ٤. اسرار درویشانه ٥. از طوایف کُرد زبان

**شەبەکە / şebeke/**: ناو. کەناڵ؛ ڕایەڵە؛ ڕایەڵکە ‹شەبەکەی تەلەڤیزیون› ☰ شبکە؛ کانال

**شەبەکی / şebekî/**: ناو. ۱. شەبەقی ۲. شەبکین؛ نەخۆشییەکی ئاژاڵە ۳. زاراوەی شەبەک ☰ ۱. اوّل بامداد ۲. نوعی بیماری دام ۳. گویشی از زبان کُردی

**شەبەندەبەڕۆژ / şebendebeřoj/**: ناو. شەبەنگەبەڕۆژ؛ سەترل‌حەمام ☰ پارچەای است

**شەبەنگ[1] / şebeng/**: ناو. شەوەنگ؛ ڕەشەک؛ ڕیزێ لە بەشگەلی پرشنگ یان شەپۆل کە بە پێی تایبەتمەندییەکی دیاریکراو لە پەنا یەک ڕێک بووە ‹لە شەبەنگی تیشکدا، سەوز دەکەوێتە نێوان زەرد و شینەوە› ☰ طیف

**شەبەنگ[2]**: ئاوەڵناو. ڕەنگامە؛ ڕەنگاوڕەنگ ☰ رنگارنگ

**شەبەنگ‌پێو / şebengpêw/**: ناو. شەبەنگ‌نوان؛ کەرەسەیەک بۆ بەرهەم هێنان و ئەندازە گرتنی شەبەنگ ☰ طیف‌سنج

**شەبەنگنوان / şebengn(i)wan/**: ☜ شەبەنگ‌پێو

**شەبەنگەبەڕۆژ / şebengebeřoj/**: ☜ شەبەندەبەڕۆژ

**شەبەنگی / şebengî/**: ئاوەڵناو. پێوەندیدار بە شەبەنگەوە ☰ طیفی

**شەبەیخون / şebeyxûn/**: ☜ شەوخونی

**شەبی / şebî/**: ئامراز. لە چەشنی؛ وەکوو؛ چون؛ شبی ☰ همانندِ؛ شبیهِ

**شەبیخون / şbîxûn/**: ☜ شەوخونی

**شەبیک / şebîk/**: ناو. ۱. نەقیزە ۲. گۆچانی شوانی ☰ ۱. سیخونک ۲. عصای چوپانی

**شەپ[1] / şep/**: ناو. ۱. پڕ بە هەر دوو دەست؛ پڕی مشت ‹شەپێ کەرە› ۲. تۆلا؛ شەق؛ کاری لێدان بە پشتە پێ ‹شەپێکی پێدا دا و گوتێ نامەوێ!› ۳. زللە؛ زلە؛ شەپەلاغە؛ شەپیلە ٤. بەری دەست ☰ ۱. پر مشت ۲. تیپا ۳. سیلی ۴. کف دست.

▣ **شەپ تێ هەڵدان**: شەق تێهەڵدان؛ بە پشتەپێ لێ دان ☰ تیپا زدن

**شەپ[2]**: دەنگ. دەنگی وێک‌کەوتنی بە پاناییەوە ‹شەپ لێی دا› ☰ صدای برخورد شیئ عریض

**شەپ[3]**: پێرۆ. ← **شەپوشۆڕ**

**شەپازلله / şepazille/**: ☜ شەپەزلە

**شەپازلە / şepaz(i)le/**: ☜ شەپەزلە

**شەپال / şepal/**: ئاوەڵناو. ڕند؛ خوشیک؛ جوانی دڵبەر و خوێن‌شیرین ☰ زیبای دلکش

**شەپالۆخ / şepalox/**: ☜ شەپلتە

**شەپالوخ / sepalûx/**: ☜ شەپلتە

**شەپاڵ / şepał/**: ناو. ۱. شێرکۆلە؛ بەچکەشێر ۲. ☜ شەپەزلە ☰ ۱. توله شیر ۲. ☜ شەپەزلە

**شەپاڵە / şepałe/**: ☜ شەپەزلە

**شەپان / şepan/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //شەپای؛ دەشەپێی؛ بشەپێ// شلەقان ☰ به هم خوردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: شەپاو/ چاوگی نەرێنی: نەشەپان

**شەپاندن / şepandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //شەپاندت؛ دەشەپێنی؛ بشەپێنە// شلەقاندن ☰ به هم زدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەشەپاندن

**شەپانکاری / şepankarî/**: ☜ شەپشەپێن

**شەپانە / şepane/**: ناو. ۱. سەرپۆشی دەفری پچووک ۲. شیپانە؛ دوولای چوار چێوەی درگا ☰ ۱. سرپوش ظرف کوچک ۲. کنارەهای چهارچوب در

**شەپانێ / şepanê/**: ناو. شەقانێ؛ تۆپان ☰ توپ‌بازی (با پا)

**شەپرزە / şepirze/**: ☜ شپرزە

**شەپرزیاگ / şepirz(i)yag/**: ☜ شپرزیاگ

**شەپرزیان / şepirzyan/**: چاوگ. شپرز بوون ☰ به هم ریختن

**شەپڕێو / şepřêw/**: ☜ شپرزە

**شەپشەپ** / şepşep/: دەنگەناو. دەنگی پای مرۆ لە کاتی ڕۆیشتندا ☜ صدای پای آدمی

**شەپشەپان** / şepşepan/: ☜ شەپشەپێن

**شەپشەپانە** / şepşepane/: ☜ شەپشەپێن

**شەپشەپانێ** / şepşepanê/: ☜ شەپشەپێن

**شەپشەپێن** / şepşepên/: نـاو. شـەپانکاری؛ شەپشەپان؛ شەپشەپانێ؛ شەپشەپانە؛ شـەقانێ؛ یارییەک کە شەپ تێهەڵدانی زۆری تێدا بێ ☜ تیپابازی

**شەپقە** / şepqe/: ☜ شەبکە

**شەپک** / şepik/: نـاو. ١. شـاپک؛ چۆغـە ٢. جاشباڵـتە؛ جـۆرێ پاڵـتاوی کـورت ٣. کوتـە تەختەیەک بۆ سوونەوەی ئامانی تازەی گلین ٤. تەختەیەک بۆ تونـد کـردنی کـەژوو لـە دەمـی چنیندا ☜ ١. نیمتنـەی پشـمی ٢. پـالتوی کوتـاه ٣. تختەی سایدن ظرف گلین ۴. تختەای کە در بـافتن نوعی تسمەی پشمی بە کار می‌رود

**شەپکە** / şepke/: ناو. ١. ☜ شەبکە ٢. ئامرازێکی جـۆلایی ٣. تەپکـەی داو ٤. داروو کـەی سـاف کردنی هەوڕ و ئامانی لە کڵ دەرهاتوو ☜ ١. ☜ شەبکە ٢. از ابزار بافندگی ٣. دام بر تختـە کوبیـدە ۴. چوب صاف کردن ظروف سُفالی

**شەپکەشان** / şepkeşan/: ناو. دەفەی شان؛ پـاڕۆی شان؛ باڵەکە؛ ئێسکی پانی شان ☜ استخوان کتف

**شەپڵ**[1] / şepl/: نـاو. ئـامرازی گاسـن داگـرتن، تـا قووڵتر بکێڵێ ☜ دستەای کە گاوآهن را با آن پایینتر می‌برند

**شەپڵ**[2]: ناوەڵناو. شپرێو؛ شپرزە ☜ پریشان؛ پراکندە

**شەپلۆر** / şeplor/: ناو. نەخۆشـییەکە لـە سـەرما و گەرما پەیدا دەبێ و وەک سوورێژە وایە ☜ نـوعی بیماری شبیە سُرخک

**شەپلە** / şeple/: نـاو. سـەکتە؛ قۆتـک؛ مفاجـات؛ دۆخی وەسـتانی لـەناکاوی دڵ یـان مێشـک ☜ سکتە

▣ **شەپلەی دڵ** ڕاوەستانی لە ناکاوی هـەموو یـان پاژێک لە ماسوولکەی دڵ ☜ سکتەی قلبی

**شەپلەی مێشک** گـیرانی دەمـارێکی مێشـک بـە تنۆکە خوێنێکی گیراو یـان هـەرچێکی تـر ☜ سکتەی مغزی

**شەپلیشەپان** / şeplîşepan/: ناو. کـاری بـە لـەپی دەست شتێ هەڵاویتن و گرتنـەوەی. هـەروەها: **شەپلیشەپان پێ کردن** ☜ کار بالا انداختن و گـرفتن چیزی

**شەپلین** / şeplîn/: چاوگ. شەرپلین؛ شپرز بـوون؛ شپرێو بوون ☜ پخش و پریشان شدن

**شەپڵاخ** / şepłax/: ☜ شەپەزلە

**شەپڵاخە** / şepłaxe/: ☜ شەپەزلە

**شەپڵاغ** / şepłağ/: ☜ شەپەزلە

**شەپڵاغە** / şepłağe/: ☜ شەپەزلە

**شەپڵتە** / şepiłte/: نـاو. شـاپەلۆخ؛ شـاپالۆخ؛ شاپەلـۆخ؛ شـەپەلۆخ؛ شـەپالووخ؛ وەروەرە؛ بەفرەلوو؛ پارووی پانی بەفر مالین ☜ داموز؛ پاروی برفروبی

**شەپڵە** / şepłe/: نـاو. ١. نەخۆشـی لـە دەسـت چوونی کۆنترۆڵی بەشێ لە ماسوولکەکانی لـەش ٢. کاری لێکدانی قنگ ٣. چەپلە؛ چەپک؛ چەپ ☜ ١. بیماری فلجی ٢. عمل باسن را بهم مالیـدن ٣. کف

▣ **شەپڵە بە قونێ** یاری و کێبەرکێی بـە زەبـر و تەوژمی لاقوونگ یەکتر فرێ دان ☜ از بازی‌ها

▣ **شەپڵە لێدان** ئیفلـیج بـوون؛ لـە دەسـت دانی کۆنترۆڵـی ویسـتەکی بەشـێ یـان هـەموو ماسوولکەکانی لەش ☜ فلج شدن

**شەپڵەلێداو** / şepłelêdaw/: ناوەڵناو. شەپڵەلێدراو؛ کوچ؛ لەپۆل ☜ فلج

**شەپڵەلێدراو** / şepłelêd(i)raw/: ☜ شەپڵەلێداو

**شەپڵەلێدراوی / şepłelêd(i)rawî/:** ناو. کـوچی؛ گۆچی؛ ئیفلیجی ☰ فلجی

**شەپنە / şepne/:** ناو. شەپنەک؛ درمـغ؛ ئامرازێکـە وەک شەن بـەڵام چـەنگاڵ ئاسـایی ☰ وسیلەای مانند شن‌کش

**شەپنەک / şepnek/:** ☜ شەپنە

**شەپنی / şepnî/:** ئاوەڵناو. تاوانکار؛ تاوانبار؛ خەتاکار ☰ خطاکار

**شەپوشۆڕ / şep û şoř/:** ئاوەڵناو. شەپەوشـۆڕ؛ شۆڕەوبووی نارێـک و تێکـەڵ-پێکـەڵ ☰ آویـزانِ نامیزان

**شەپۆپە / şepope/:** نـاو. شـەپۆتە؛ کەڵـکیت؛ کەرکیت؛ دەفەی جۆلایی ☰ دفته؛ از ابزار بافندگی

**شەپۆتە / şepote/:** ☜ شەپۆپە

**شەپۆڕ / şepoř/:** نـاو. شـیوەن؛ شـین؛ چەمـەرە؛ چەمبەرە؛ بانگ؛ ڕۆ ـ ڕۆ؛ ڕوایڕوو؛ شین و گریـان بە دەنگی بەرز، بۆ شینگێری (پتر لەگەڵ «شین»دا دێ) ‹لە هەر شەقام و کووچەیەک شـەپۆڕ و شـینە/ دێ بەرەو دڵم «سوارە»› ☰ شیون

**شەپۆڕنامە / şepořname/:** ناو. شین‌نامە ☰ مرثیه

**شەپۆکان / şepokan/:** چـاوگ. شـەپۆکیان؛ پەشۆکان؛ سەر لێ‌تێکچوون؛ وڕ بـوون ☰ هـاج و واج شدن

**شەپۆکیان / şepokyan/:** ☜ شەپۆکان

**شەپۆل / şepol/:** ناو. پێل؛ شەپێل؛ شیپە؛ شیپەل: ١. سیپەل؛ لیپ؛ لیپاو؛ لـەف؛ پـەل؛ مـۆنج؛ بـۆڕ؛ کۆما ئاوی بەرزەوە بووی بزۆک ‹بە تەحریکی هەوا دیت و دەچی چەشنی شەپۆلی ئاو/ سـەراپا غـەرقی گێـژاوی غـەم و بـەحری خـەیالاتی «بێخـود»› ٢. نژمێک لـە کەوانەگـەلی لـە شـوێن یـەکی وەک یـەک ‹شەپۆلـی ڕادیـۆیی› ٣. *[مەجاز]* دۆخـی هەڵـکفان و یـاخی بـوونی هەسـتی دەروون ‹شەپۆلی تووڕەیی› ٤. تەوژمی خێرا و کوت‌وپڕی ‹شەپۆلی هەوای گەرم› ☰ ١تا٤. موج

⊡ **شەپۆل (لێ)دان:** ١. پێل دان ٢. *[مەجاز]* یەکجار زۆر بوون (لە باسی زانـایی کەسـێکدا دەگـوترێ) ‹مامۆسـتاکەمان لـە بـواری زمانەوانیـدا، زانسـتی شەپۆل لێ نەدا› ☰ ١. موج زدن ٢. فراوان بودن

**شەپۆلاوی / şepolawî/:** ئاوەڵناو. شەپۆلدەر؛ بەپێل؛ بەمۆنج؛ بە بەرز و نزمی وەک یەک و هاوشـانەوە ☰ موجدار؛ مواج

**شەپۆلپێو / şepolpêw/:** نـاو. ئـامرازی پێـوانی ڕادەی بەرزی، خێرایی، تەوژم و ...ی شەپۆل ☰ موج‌سنج

**شەپۆلدەر / şepolder/:** ☜ شەپۆلاوی

**شەپۆلڕەوێن / şepolřewên/:** نـاو. شـەپۆلگرەوە؛ دیوار یان هەر جۆرە بـەرگرێک بـۆ ڕەواندنـەوەی هێـزی پێلـی گـەورە و مەترسـیدار ☰ مـوجگیر؛ موج‌شکن

**شەپۆلک / şepolik/:** ناو. شەپۆلکە؛ شیپەلک؛ پێلی کەم و بچووک ☰ موج کوچک

**شەپۆلکە / şepolke/:** نـاو. ١. ☜ شـەپۆلک ٢. زللە؛ زیللە؛ شەقەزلە ☰ ١. ☜ شەپۆلك ٢. سیلی

**شەپۆلگرەوە / şepolg(i)rewe/:** ☜ شەپۆلڕەوێن

**شەپە[1] / şepe/:** نـاو. ١. کۆمەڵـە بـەفری بـە سـەر یەکدا کراو ٢. ڕنوو؛ ڕنی؛ کلێلە؛ شـاپە؛ شـاپ ☰ ١. برف برهم انباشته ٢. بهمن

**شەپە[2]:** دەنگەناو. ١. خشـە؛ کشـە؛ دەنگـی لێـک ساوینی دوو شتی وشـک و زبر ٢. ☜ شڵپە[2] ☰ ١. خِش ٢. ☜ شڵپە[2]

**شەپەتێرێ / şepetêrê/:** نـاو. نـاوی یارییـەکی منداڵانە ☰ از بازی‌های کودکانه

**شەپەر / şeper/:** ناو. شـاباڵ؛ سـەرباڵ؛ شـاپەڕ ☰ شهپر

**شەپەزڵلە / şepezille/:** ☜ شەپەزلە

**شەپەزلە / şepez(i)le/:** نـاو. شـەپازللە؛ شـەپازلە؛

شەپاڵ؛ شەپالە؛ شەپەزللە؛ شەپلاخ؛ شەپلاخە؛ شەپلاغ؛ شەپلاغە؛ شەپەلاخە؛ شەپەلاغە؛ شەپیلە؛ شەقازللە؛ شەقازلە؛ شەقەزللە؛ شەقەزلە؛ شەقەزیلە؛ شەماق؛ شیلاقە؛ شیلپاخ؛ زەرپێ کە بە لەپی دەست لە دەموچاو و لامل کەسێ دەدرێ ≡ سیلی

**شەپەشەپ**[1] / şepeşep/: ئاوەڵکار. بە لەخشەلەخش ‹تەلیسەکەی شەپەشەپ هێنا› ≡ کشان ـ کشان

**شەپەشەپ**[2]: دەنگەناو. ١. خشەخش ٢. ☜ شلپەشلپ ≡ ١. خِش‌خِش ٢. ☜ شلپەشلپ

**شەپەلۆح** / şepeloĥ/: ناو. دارێکە لە شوێنی گەرمەسێر دەڕوێ ≡ درختی است گرمسیری

**شەپەلۆخ**[1] / şepelox/: ☜ شەپلتە

**شەپەلۆخ**[2]: ئاوەڵناو. *[کینایە]* زۆرخۆر؛ فرەخۆر ≡ پرخور

**شەپەلاخە** / şepełaxe/: ☜ شەپەزلە

**شەپەلاغە** / şepełağe/: ☜ شەپەزلە

**شەپەوشۆڕ** / şepe w şoř/: ☜ شەپوشۆڕ

**شەپیتکە** / şepîtke/: ☜ شەپیتە

**شەپیتە** / şepîte/: ناو. شەپیتکە؛ ئامرازێکی جۆلایی تێوەدانی پێ توند و سفت دەکرێتەوە ≡ از ابزار بافندگی

**شەپیلک** / şepîlik/: ناو. باڵەکە؛ دەفەی شان؛ ئێسکی پانی تەنکەی شان ≡ استخوان کتف

**شەپیلە** / şepîle/: ☜ شەپەزلە

**شەپێل** / şepêl/: ☜ شەپۆل

**شەپێو** / şepêw/: ناو. داری لەلەکراو بۆ ئەندازە گرتنی تەڕ بوونی زەوی لە باران ≡ قطعە چوب سنجش نفوذ باران

**شەت**[1] / şet/: ناو. زێ؛ چەمی گەورە ≡ رود بزرگ؛ شط

**شەت**[2]: ئاوەڵناو. ١. قیلەوقاچ بڕاو ٢. ڕاست و بێ‌لوول و پێچ (موو) ≡ ١. أریب ٢. صاف (مو)

**شەتاندن** / şetandin/: چاوگ. ١. بەستن؛ بەستنەوە؛ شتێک بە بەن، گیرە و ... توند کردن ٢. پێچاندنەوە؛ پێچانن؛ لوول دان؛ لوولە کردن؛ وەرگەڕاندن بە دەورە خۆدا ≡ ١. بستن ٢. پیچاندن

**شەتاو** / şetaw/: ناو. ١. ئاوی زۆر کە لە بەفری تاویاوە سەرچاوە دەگرێ ‹چوون دیوانەی شۆر ئازیز نە سەردا/ شەتاو سەر هۆرگێرت وە دەشت و دەردا «مەولەوی»› ٢. ئاوی ساردێ کە لە گەرمادا لە ئەسپی دەپڕژێنن ≡ ١. رودی کە از برفابها سرچشمە می‌گیرد ٢. آب خنکی کە در گرما بر اسب می‌پاشند

**شەترنج** / şetrinc/: ☜ شەترەنج

**شەترەنج** / şetrenc/: ناو. شاترنج؛ شترنج؛ شاتورنج؛ شەترنج؛ سوترنج؛ سەترنج؛ سەرترینج؛ یارییەکی دوو کەسی بە سەر پەڕەیەکی چوارگۆشەی ٦٤ خانووی یەک نا یەک ڕەش و سپی و ١٦ مۆرەی ڕەش و ١٦ مۆرەی سپییەوە، برێتی لە ٨ سەرباز، ٢ قەلا، ٢ ئەسپ، ٢ فیل، وەزیر و شایەک بۆ هەرکام لە یاریزانان ≡ شطرنج

**شەترەنجی** / şetrencî/: ☜ چوارخانە

**شەتری** / şetrî/: ناو. گێل‌گێلە؛ ڕێزە گولینگەی سەر و پۆڕ ≡ منگولەهای سر و دستار

**شەتڵ**[1] / şet(i)ł/: ناو. شەخڵ؛ شتل؛ شتڵ ≡ نشا

**شەتڵ**[2]: ☜ شەلاڵ[2]

**شەتڵجاڕ** / şet(i)łcař/: ناو. شتڵجاڕ؛ شەتڵگە ≡ نشازار

**شەتڵگە** / şetiłge/: ☜ شەتڵجاڕ

**شەتوپەت**[1] / şet û pet/: ئاوەڵناو. پارچە ـ پارچە؛ شڕوشیتاڵ؛ لەت‌وکوت ‹کراسی شەتوپەت› ≡ پارە ـ پورە

⊡ **شەتوپەت کردن**: شڕ کردن؛ دڕاندن ‹کراسەکەمی شەتوپەت کرد!› ≡ پارە ـ پارە کردن

**شەتوپەت**[2]: ئاوەڵکار. پارچە ـ پارچە؛ شڕوشیتاڵ؛

لەت‌وکوت 🇮🇷 پاره ـ پاره

**شەت‌وکوت** / şet û kut/: ناو. ١. کاری لێدانی بێ دەست پاراستن ٢. شیروکوت؛ وشەیەکە لە هەڵبژاردنی دەستەی یاریدا بۆ یەکێکی دەڵێن کە تەنیا دەمێنێتەوە 🇮🇷 ١. عمل بی ملاحظه و احتیاط زدن ٢. اصطلاحی هنگام یارگیری در بازی

**شەتور** / şetûr/: ☜ شەفتور

**شەتە** / şete/: ناو. ١. ☜ شوبە ـ٢ ٢. ☜ شەلیتە

**شەتەڕە** / şeteře/: ☜ شاتەڕە

**شەتەک** / şetek/: ناو. کاری توند بەستن و جوولە لێ برین ‹شەتەک درا لە دار درەنگانی شەو/ لاوێک لە سەر ڕزگار بوونی وەتەنی «هێمن»› 🇮🇷 عمل سفت و مُحکم بستن

▣ **شەتەک دان**: شەتەن دان؛ توند داپێچان و جوولە لێ برین. هەروەها: **شەتەک دران** 🇮🇷 محکم پیچیدن و بستن

**شەتەکدراو** / şetekd(i)raw/: ئاوەڵناو. دەندی؛ بە گوریس بەستراو 🇮🇷 طناب‌پیچ

**شەتەن** / şeten/: ناو. تەنافی شت پێچان 🇮🇷 طناب برای بستن

▣ **شەتەن دان**: ☜ شەتەك دان

**شەتیر** / şetîr/: ناو. ساتۆر 🇮🇷 ساطور

**شەجۆ** / şeco/: ئاوەڵناو. جوامێر؛ جامێر 🇮🇷 جوانمرد؛ رادمرد

**شەجو**[1] / şecû/: ناو. جۆباری گەورە 🇮🇷 نهر

**شەجو**[2]: ئاوەڵناو. مەرد و ڕەند 🇮🇷 جوانمرد

**شەجەرە** / şecere/: ناو. ڕەگەزنامە؛ سەجەرە؛ سەرجەلە؛ نووسراوەیێ کە بن و بنەچەک و خزم و خانەدانی کەسێکی هەڵداوە و گەلەک جاریش بە شێوەی دارێک نیشان دەدرێ 🇮🇷 شجره‌نامه

**شەحرمەحر** / şeĥ(i)rmeĥ(i)r/: ☜ شەهمار

**شەحنە** / şeĥne/: ناو. شانە؛ دارۆغە 🇮🇷 داروغه

**شەخار** / şexar/: ناو. خۆڵەمێشی دڕک و داڵی سارا کە بۆ دروست کردنی سابوون بە کار دێت 🇮🇷 شخار

**شەخت** / şext/: ئاوەڵناو. لە هەردوو دەست شەل (حیوان) 🇮🇷 دو دست لنگ (حیوان)

**شەختاندن** / şextandin/: چاوگ. سەرەوژێر کردن 🇮🇷 سرازیر کردن

**شەختۆ** / şexto/: ئاوەڵناو. ١. تەمەڵ؛ لەش‌گران ٢. تێکەڵ-پێکەڵ و نارێک 🇮🇷 ١. تنبل؛ لش ٢. درهم‌برهم

**شەختە** / şexte/: ناو. شختە؛ شەخسە: ١. شەڵتە؛ سەرمای پاییز کە زەرعات خراپ دەکا ‹دیارە لای شەختەیە ناخۆش خەوەرێ/ دارە خۆی دەرنێ، خەزەڵ هەڵدەوەرێ «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ٢. سەهۆڵ؛ سۆڵ؛ یەخ ٣. بەستەڵەک 🇮🇷 ١. سرمای پاییزی آفت کشت ٢. یخ ٣. یخبندان

▣ **شەختە نەنگاوتن**: سەرما و سۆڵە لێ دان 🇮🇷 سرما زدن زراعت

**شەختە بزووتن**: سەرما و سۆڵە ڕەوینەوە ‹تێپەڕی پایز و سەرما ئەنگووت/ لەپڕێ بەستەڵەک و شەختە بزووت «حەقیقی»› 🇮🇷 سرما و یخبندان سپری شدن

**شەختە کەوتن**: شەختە هاتن؛ سەرما و بەستەڵەک پێش هاتن ‹هۆلی بینا نا بزن و تێ خزی/ شەختە کەوت قاچ و قولی پەز تەزی «حەقیقی»› 🇮🇷 سرما و یخبندان فرارسیدن

**شەختە هاتن**: ☜ شەختە کەوتن

**شەختەلێداو** / şextelêdaw/: ئاوەڵناو. قەیسەربردوو؛ سەرمابردوو 🇮🇷 سرمازده

**شەختە و بەند** / şexte w bend/: ناو. سەرما و بەستەڵەک ‹تۆ برۆ تا زووە لەو مەڵبەندە/ هەڕەتی هاتنی شەختە و بەندە «حەقیقی»› 🇮🇷 سرما و یخبندان

**شەختی / şextî/**: ناو. کوچی؛ گۆچی؛ شەهتی؛ شەپلەلێدراوی ⊠ فلجی

**شەختین / şextîn/**: چاوگ. سەرەوژێر بوون ⊠ سرازیر شدن

**شەخرە / şexre/**: ☜ شەغرە

**شەخرەکێش / şexrekêş/**: ☜ شەغرەکێش

**شەخس / şexs/**: ناو. ۱. مرۆ؛ کەس ‹دەبێ شەخسێک -هەرکێ بێ- بکرێتە قوربانی دە پێناوی مەسلەحەتی گشتیدا... «هەژار، چێشتی مجێور»› ۲. قەبری چاکان ‹مەلا وەیسی گوتی: کاک هەژار! هیچ کەس تا ئێستا نەیوێراوە پووشێکیش لەم قەبرستانە بەرێ؛ دیارە شەخسێکی زۆر تووڕەیە! «هەژار، چێشتی مجێور»› ⊠ ۱. شخص ۲. مزار مُتبرکە

**شەخساڵ / şexsał/**: ناو. بێشەی چوغور ⊠ بیشەی انبوە

**شەخسان / şexsan/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //شەخسای؛ دەشەخسێ؛ بشەخسێ// شەخسین؛ بێڕەنگ بوون؛ ڕەنگ پێ نەمان لە بەر نەخۆشی ⊠ رنگ پریدن از بیماری

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: شەخساو/ چاوگی نەرێنی: نەشەخسان

**شەخساو / şexsaw/**: ئاوەڵناو. شەخسیو؛ بێڕەنگ؛ ڕەنگ‌گۆڕاو لە بەر نەخۆشی ⊠ رنگ‌باختە از بیماری

**شەخسە / şexse/**: ☜ شەختە

**شەخسین / şexsîn/**: ☜ شەخسان

**شەخسیو / şexsîw/**: ☜ شەخساو

**شەخسێ‌ووەخسێ / şexsê w wexsê/**: ناو. [پەلار] دەستەی قەتڵ برینەوە ⊠ مراسم عزاداری مُحرم

**شەخف / şexf/**: ناو. بانەناو؛ کاری بە کاگڵ بان سواغ دان ⊠ کاهگل‌کاری پشت‌بام

**شەخڵ / şexił/**: ☜ شەتڵ[1]

**شەخەڵ / şexeł/**: ☜ شخەڵ

**شەخەڵان / şexełan/**: ناو. ۱. زەلجار؛ ژاژەڵان؛ قامیشەڵان ۲. شەخەڵە؛ بێشەی چوغور ⊠ ۱. نیزار ۲. بیشەی انبوە

**شەخەڵمەخەڵ / şexełmexeł/**: ناو. شەخەڵومەخەڵ: ۱. خشت‌وخاڵ؛ پووش‌وپاڵ؛ هەژگ‌وپژاڵ؛ شتی بێ‌بایەخ و دەسگر ۲. تڕتفاق؛ ترۆتفاق؛ خڕەوپڕە ⊠ ۱. آت و آشغال ۲. خِرت‌وپِرت

**شەخەڵومەخەڵ / şexeł û mexeł/**: ☜ شەخەڵمەخەڵ

**شەخەڵە / şexełe/**: ☜ شەخەڵان ـ۲

**▪ شەد / şed-/**: پاشەوشە. شد؛ بەستن ⊠ بست

**شەدار / şedar/**: ئاوەڵناو. شێدار؛ نمدار ⊠ نمناک

**شەداندن / şedandin/**: چاوگ. شەتەک دان ⊠ مُحکم بستن و پیچیدن

**شەدانک / şedanik/**: ☜ شادانە

**شەدانە / şedane/**: ☜ شادانە

**شەددە / şedde/**: ناو. گیرە؛ دووپات؛ نیشانەیەک لە ڕێنووسی عارەبی و فارسی، لە کۆتایی بڕگەیەک و سەرەتای بڕگەیەکی‌تری وشەدا، بە شێوەی «ّ» کە لە سەر هەر پیتێک دابنرێ ئەو پیتە دووجار دەخوێندرێتەوە ⊠ علامت تشدید

**شەدە / şede/**: ناو. ۱. مشکی؛ پارچەیەکی ڕەش یان سووری ئاوریشمە بۆ سەرپێچ و مێزەر ۲. سەر و پێچی ژنان ‹شوان وە هەوهەو پەز وە قۆڕەوە/ لەنجە ها وە لای شەدە شۆڕەوە «فولکلۆر»› ⊠ ۱. پارچەای ابریشمی برای دستار ۲. سرودستار زنانە

**شەر / şer/**: ناو. سەر ⊠ سر

⊡ **شەر ژێ‌کرن**: سەر ژێ کرن؛ سەر برین؛ سەر لە لەش جیا کردنەوە ⊠ سر بُریدن

**شەرا / şera/**: ناو. شەڕا: ۱. بای گەرمی زیانی بێستان ۲. گەرمای زۆری هاوینە ۳. خێشکی

کلۆش کێشان بۆ سەر خۆیان ٤. بێهۆشی لە بەر ژانی زۆر ▪ ١. باد گرم آفت جالیز ٢. شراره؛ گرمای سوزان ٣. تور جابەجا کردن غلەی درویدە ۴. حالت بیهوشی بر اثر درد شدید

▫ **شەرا دادان**: تاو گرتنی گەرمای هاوینە ▪ شدت گرفتن گرما

**چونە شەرای مەرگ**: نزیک لە مردن کەوتنەوە ‹چوومە شەرای مەرگ، عەجەب نەمردم! «فولکلۆر»› ▪ به حد مرگ رسیدن

**شەراب** / şerab/: ناو. شەراو؛ شەڕاب؛ بادە ▪ شراب

**شەرابخانە** / şerabxane/: شەراوخانە؛ دووکانی بادەفرۆشی ▪ میخانە

**شەرابخۆر** / şerabxor/: ناو/ ئاوەڵناو. شەرابخۆرەوە؛ شەراوخۆر ▪ میگُسار

**شەرابخۆرەوە** / şerabxorewe/: ☜ **شەرابخۆر**

**شەرابخۆری** / şerabxorî/: ☜ **بادەنۆشی**

**شەرابردگ** / şerabirdig/: ☜ **شەرابردو**

**شەرابردو** / şerabirdû/: ئاوەڵناو. شەرابردگ؛ شەرابردە؛ شەرالێداو؛ شەڕابردوو؛ شەڕابردگ؛ شەڕابردە؛ شەڕالێدراو؛ گەرمابردوو ▪ گرمازده

**شەرابردە** / şerabirde/: ☜ **شەرابردو**

**شەرابفرۆش** / şerabf(i)roş/: ناو. شەراوفرۆش؛ کەسێ کە بادە دەفرۆشێ ▪ بادەفروش

**شەرابی** / şerabî/: ئاوەڵناو. شەراوی: ١. بە ڕەنگی سووری ئامال ڕەش ٢. شەرابخۆر ▪ ١. رنگ شرابی ٢. شرابخوار

**شەرالێداو** / şeralêdaw/: ☜ **شەرابردو**

**شەرانخێوی** / şeranxêwî/: ناو. شەڕانخێوی؛ شەڕناخێوی؛ غارغارێن بە ئەسپ لە مەیداندا ▪ تاخت و تاز در میدان

**شەراو** / şeraw/: ☜ **شەراب**

**شەراوخانە** / şerawxane/: ☜ **شەرابخانە**

**شەراوخۆر** / şerawxor/: ☜ **شەرابخۆر**

**شەراوفرۆش** / şerawf(i)roş/: ☜ **شەرابفرۆش**

**شەراوی** / şerawî/: ☜ **شەرابی**

**شەربە** / şerbe/: ناو. شەروە؛ دەفری ئاو خواردنەوە لە سوالەت ▪ ظرف آبخوری سُفالین

**شەربەت** / şerbet/: ناو. ١. شەربەتاو؛ خواردنەوەیەک لە ئاو، ئارەق یان شیلە و ماکێکی شیرین ٢. تراوی خواردنەوە بۆ دەرمان ‹شەربەتی کۆخە› ▪ ١و٢. شربت

**شەربەتاو** / şerbetaw/: ناو. شەربەت؛ خواردنەوەیەک لە ئاو، شیلە و ماکێکی شیرین ▪ شربت

**شەربەتچی** / şerbetçî/: ناو. ١. کەسێ شەربەت دروست دەکا ٢. کەسێ شەربەت ئەفرۆشێ ▪ ١. شربتساز ٢. شربتفروش

**شەربەتخۆری** / şerbetxorî/: ناو. ١. میوانی شەربەت خواردنەوە بۆ شادی ٢. دەفری شەربەت خواردنەوە ▪ ١. مهمانی شربتخوری ٢. ظرف شربتخوری

**شەربەتساز** / şerbetsaz/: ناو. کەسێ شەربەت دروست ئەکا ▪ شربتساز

**شەربەتفرۆش** / şerbetf(i)roş/: ناو. کەسێ شەربەت بە پارە ئەدا ▪ شربتفروش

**شەرپا** / şerpa/: ناو. لەچک؛ ڕووسەری ▪ روسری

**شەرپل** / şerpil/: ئاوەڵناو. سەرگەردان؛ گێژ و داماو ▪ مات و سرگردان

**شەرپلان** / şerp(i)lan/: چاوگ. شەرپلین؛ واق‌ورمان؛ دژدامان؛ سەر لێ شێوان ▪ مات و مُتحیر شدن

**شەرپلاندن** / şerp(i)landin/: چاوگ. سەر لێ شێواندن ▪ مات و مُتحیر کردن

**شەرپلین** / şerp(i)lîn/: ☜ **شەرپلان**

**شەرپەزە** / şerpeze/: ☜ **شپرزە**

**شەرت** / şert/: ناو. ١. گرێو؛ گرەو؛ بەندیواری نێوان

کـــار یـــان دیاردەیـــەک لەگـــەڵ کـــار یـــان دیاردەیەکی تردا، بە جۆرێ کـە یـەکێکیان بـەبێ ئەوی دیکە جێبەجێ نەبێت ‹من ئێـژم ناچـێ، بـا شەرت بوەسین!› ٢. پێویست؛ پێداویست؛ کـارێ کە جێبـەجێ کـردن یـان بـەجێ هێشـتنی لـە ڕەوتی بڕیارنامەیەکـدا وەئەسـتۆ گـیراوە ‹قـەولی ڕەسوولی ئاخر زەمانە/ وەتەن خۆش ویستن، شەرتـی ئیمانـە «مـوفتی پێنجـوێنی»› ٣. بـڕیار؛ گفـت؛ هەڤبەست؛ پەیمان ‹نەمردم من ئەگەر ئەمجارە بێ تۆ/ نەچم، شەرت بێ، هەتا ئەو خوارە بێ تۆ «نـالی»› ٤. کرێی ڕەنجبەر و شـوان و گـاوان ≡ ١. شـرط؛ شرطبندی ٢. لازمە ٣. عهد و پیمان ۴. مُزد کارگر

⊡ **بە شەرتی چەقۆ:** بـە مـەرجی چـەقۆ لـێ دان پێش لە کڕین (بۆ شووتی و جار-جاریش کاڵەک)
≡ بە شرط چاقو

⊡ **شەرت بردنە سەر:** لە سەر پەیمان بوون تا ئـاخر
≡ بر عهد و پیمان ثابت ماندن

**شەرت بوون:** ١. بەڵێن بوون؛ قەوڵ بوون ‹شەرت بێ لە داخت خۆم سـیاپۆش کـەم «فولکلـۆر»› ٢. مەرج بوون؛ حیسـاب بـوون ‹چـۆن بـڕێ شـەرتە نەوەک چەندە بڕێ «سوارە»› ≡ ١. قـول دادن ٢. شرط بودن

**شەرت بەستن:** گرێو/ گرەو کردن ≡ شـرطبنـدی کردن

**شەرت پەڕین:** تەواو بوونی وادەی شوانی ≡ تمام شدن مدت چوپانی

**شەرت کردن:** ١. پـەیمان بەسـتن؛ ڕەخسـانی بارێک یان کودانی کارێک و جێبەجێ کـردنی ئەرکێک لە داهاتوودا وە ئەستۆ گرتن ٢. گرێـو کردن ≡ ١. عهد کردن ٢. شرط بستن

**شەرتبەنی** / şertbenî/: ناو. گرێو؛ مەرج؛ بەڵێن لـە پێناوی دانی شتێک لە لایەن یەکێک لە دوولاوە ئەگەر شـتێکی دیـاریکراو ڕوو بـدا یـان نـەدا ≡ شرطبندی

**شەرتک** / şertik/: ناو. چۆڵـەمەی ئەسـتۆ ≡ جنـاغ سینه

**شەرتوشۆن** / şert û şon/: نـاو. ڕەوتی پـەیمان ڕاگـرتن ‹مـەزانی نـازار سـاحێب شـەرتوشـۆن !/ سەیدی کوشتەی داخ دەرد دووری تۆن «سـەیدی»› ≡ عهد و پیمان

**شەرتوقەرار** / şert û qerar/: نـاو. پـەیمان؛ بـڕیار؛ سۆز ≡ عهد و پیمان

**شەرتەشوانی** / şerteş(i)wanî/: نـاو. گیسـک یـان کاوڕێک کە لە کاتی شەرت پەڕینی شـواندا پێـی دەدەن ≡ بُز یا بُزغالەای کە هنگام خاتمەی خـدمت چوپان به او می‌دهند

**شەرتی** / şertî/: ئاوەڵناو. مـەرجی: ١. شـەرتدار ٢. مەرجین؛ بە مەرجی شتێ ≡ ١و٢. شرطی

⊡ **شـەرتی بونـەوە:** *(دروون‌ناسـی)* مـەرجی بـوون؛ سەرهەڵدانی بارودۆخێک لە گیانداردا کـە لـە هەمبـەر دیـاردە یـان کـارێکی دیـاریکراوەوە کاردانەوەیەکی دیـاریکراوی هـەبێ ≡ شـرطی شدن

**شەرتین** / şertîn/: ئاوەڵـناو. شـیلەوگەرم؛ شـەلۆ ≡ ولرم

**شەرح** / şerḧ/: نـاو. ١. ڕاڤە؛ شرۆڤە ٢. ڕێوشوێنی ئایینی ≡ ١. شرح ٢. شرع

**شەردانِدن** / şerdandin/: چـاوگ. ١. ئاوارە کـردن؛ بلاو کردن لە جێگەی خۆ ٢. ☜ **سەردانـدن** ≡ ١. آوارە کردن ٢. ☜ **سەرداندن**

**شەردە** / şerde/: نـاو. کار و ڕەوتی خـودان کـردن؛ ڕاهێنان؛ پەروەردە کردن ≡ تربیت

**شەردین** / şerdîn/: چـاوگ. ئـاوارە بـوون ≡ آوارە شدن

**شەرشوب** / şerşûb/: ناو. لاسەرە؛ خشڵێکی سەری ژنانە ≡ زیورِ سر

**شەرع** / şer'/: ناو. ١. دین؛ شەریعەت ‹شەرعی ئیسلام› ٢. قانوونی دین ‹ بە پێی شەرع› ٣. چار؛ چارە؛ عیلاج ‹شەرعی مار بە دار «مەسەل»› ⊒ ١و٢. شرع ٣. چارە

**شەرعی** / şer'î/: ناو. ١. دینی؛ پێوەندیدار بە دینەوە ‹ئەرکە شەرعییەکان› ٢. تەبا لەگەڵ ئاییندا ‹کاری شەرعی› ⊒ ١و٢. شرعی

**شەرعیات** / şer'(i)yat/: ناو. ئامۆژەی دینی، بەتایبەت ئەوانەی سەر بە عیبادەت و ئەرکە دینییەکانن ⊒ شرعیّات

**شەرگە** / şerge/: ناو. نێرینەی چەم؛ ناوەڕاستی هەرەقووڵی ڕۆخانە ⊒ عُمق رودخانه

**شەرم** / şerm/: ناو. ١. هەستی زیز بوونی عاتیفی بە هۆی: *ئا)* ئاگادار بوونەوە لە سووچ و گوناح *ب)* هەبوونی عەیب یا کەمایەسی *ج)* پەشیمانی، سەرکۆنە یان سووک بوون ‹چاویان مەست و پڕ شەرم بوو/ بسکیان ئاوریشمی نەرم بوو «هێمن»› ٢. حەیا؛ فەدی؛ فهێت؛ ئەخماز؛ ڕەوتی خۆ لادان لە ئەنجام دانی کارێک لە بەر ترس لە زەلیلی و ئابڕوو چوون ‹شەرمی بوو لەوەی کە خەڵکی بزانن ترساوە و هەڵاتووە› ٣. دۆخی سڵ کردنی زەین لە ئەنجامدانی کارێ کە ڕەنگە ببێتە هۆی ڕەنجاندن و پێناخۆش بوونی خەڵک ٤. *[کنایە]* ناوگەڵی ژن ٥. شوورەیی؛ عیب و عار ‹با مەی بپەرستین و ئیتر واز بێنین/ تا وا بێ موسوڵمانەتی شەرم و نەنگە «هەزار، *چوارینەکانی خەییام*»› ⊒ ١تا٣. شرم ٤. شرمگاه زن ٥. ننگ؛ عار

⊡ **شەرم شکان:** فهێد نەمان؛ ڕوو کرانەوە ⊒ رو باز شدن

**شەرم کردن:** ١. فەدی کردن؛ خەجاڵەتی کێشان ٢. ڕوو کردن ⊒ ١. خجالت کشیدن ٢. شرم حضور داشتن

**شەرماندن** / şermandin/: چاوگ. شەرمەزار کردن ⊒ محکوم کردن

**شەرماهی** / şermahî/: ناو. شەرم و شوورەیی؛ فەدی ⊒ خجالت

**شەرمتکاو** / şermt(i)kaw/: ئاوەڵناو. کەلپزە؛ کەلپزا؛ بێئابڕوو ⊒ بی‌شرم

**شەرمخاندن** / şerm(i)xandin/: چاوگ. ڕنین؛ داڕووشاندن ⊒ خراشیدن

**شەرمخین** / şerm(i)xîn/: چاوگ. ڕنران؛ داڕووشان ⊒ خراشیده شدن

**شەرمدار** / şer(i)mdar/: ئاوەڵناو. بەحەیا؛ بەئابڕوو. هەروەها: **شەرمداری** ⊒ آبرومند

**شەرمسار** / şer(i)msar/: ☜ **شەرمەزار**

**شەرمساری** / şer(i)msarî/: ☜ **شەرمەزاری**

**شەرمشکاو** / şermş(i)kaw/: ئاوەڵناو. بازەڵە؛ هەڵماڵراو؛ بازێلە ⊒ از خجالت درآمده

**شەرمگا** / şer(i)mga/: ناو. شەرمگە؛ ناوگەڵ ⊒ شرمگاه

**شەرمگە** / şer(i)mge/: ☜ **شەرمگا**

**شەرمن** / şermin/: ئاوەڵناو. شەرمنۆک؛ شەرمۆ؛ شەرمۆک؛ شەرمەون؛ شەرمی؛ شەرمێون؛ کەمڕوو؛ ڕووتەنک ⊒ خجالتی؛ کم‌رو

**شەرمندە** / şerminde/: ☜ **شەرمەندە**

**شەرمنۆک** / şerm(i)nok/: ☜ **شەرمن**

**شەرمنە** / şerm(i)ne/: ☜ **شەرمەندە**

**شەرمنەماو** / şermnemaw/: ئاوەڵناو. خەنزار؛ ڕسوا؛ ئابڕووتکاو ⊒ رسوا

**شەرمنی** / şerm(i)nî/: ناو/ ئاوەڵناو. ١. شەرمداری؛ شەرمێونی ٢. مزر؛ مەیخۆش؛ ترش و شیرین ⊒ ١. شرمگینی ٢. ترش و شیرین

**شەرمۆ** / şermo/: ☜ **شەرمن**

**شەرمۆک** / şermok/: ☜ **شەرمن**

**شەرموت** / şermût/: ناو. ١. گلۆڵە دەزووی دروومان ٢. جۆرێ ماسی ⊒ ١. گلوله نخ خیاطی ٢.

نوعی ماهی

**شەرمەزار / şermezar/**: ئاوەڵناو. شەرمسار؛ شەرمەسار؛ ڕووزەرد ☰ شرمسار

◘ **شەرمەزار کردن**: مەحکووم کردن. هەروەها: **شەرمەزار بوون** ☰ محکوم کردن

**شەرمەزاری / şermezarî/**: ناو. شەرمساری؛ شەرمەساری؛ ڕووزەردی ☰ شرمساری

**شەرمەسار / şermesar/**: ☜ **شەرمەزار**

**شەرمەساری / şermesarî/**: ☜ **شەرمەزاری**

**شەرمەشکانە / şermeş(i)kane/**: ☜ **شەرمەشکانێ**

**شەرمەشکانێ / şermeş(i)kanê/**: ناو. شەرمەشکانە؛ سەرمەشقانە؛ سەرمەشقانێ؛ دیارییەک زاوا دەیدا بە بووک، تارا لە سەر ڕووی لادا ☰ رونمای عروس

**شەرمەگیلاخە / şermegîlaxe/**: ناو. [پلار] شەرمی ڕواڵەتی بەلام لە دڵەوە پێ خۆش ☰ شرم ظاهری

**شەرمەندە / şermende/**: ئاوەڵناو. شەرمندە؛ شەرمنە؛ شەرمەنە؛ خەجاڵەت؛ فەدیکار ‹ئای سوبح مەحشەر سەرئەفکەندە وێم/ شەرمەندەی حوزوور خودا و بەندە وێم «مەولەوی»› ☰ شرمنده

**شەرمەنە / şermene/**: ☜ **شەرمەندە**

**شەرمەون / şermewin/**: ☜ **شەرمن**

**شەرمی / şermî/**: ☜ **شەرمن**

**شەرمین / şermîn/**: ئاوەڵناو. بەشەرم؛ فهێتکار؛ حەیابەخۆ ☰ باحُجب و حیا

**شەرمینۆک / şermînok/**: ناو. گوڵێکی جوانە بە چەند ڕەنگان ☰ گُل ناز؛ گُل قهر

**شەرمێون / şermêwin/**: ☜ **شەرمن**

**شەرمێونی / şermêw(i)nî/**: ☜ **شەرمنی ـ١**

**شەرواڵ / şerwał/**: ☜ **شواڵ**

**شەرواڵبەکۆڵ / şerwałbekoł/**: ناو. شەواڵ بەکۆڵ؛ شەواڵەسوورە؛ شەواڵەمۆر؛ گیایەکە بنکەکەی دەخورێ ☰ گیاهی با پیاز خوردنی

**شەروە / şerwe/**: ☜ **شەربە**

**شەرەت / şeret/**: ئاوەڵناو. دەربەدەر؛ ئاوارە و ڕەبەن ☰ آواره و بی‌نام و نشان

**شەرەف / şeref/**: ناو. شەڕەف؛ سەخەر؛ ناوچاکی و وەجی کۆمەڵایەتی کە لە ڕێز دانان بۆ بایەخگەلی ئەخلاقی بەدی دێ ☰ شَرَف

**شەریح / şerîĥ/**: ناو. گۆشتی نەرمەی بێ پێشە ☰ فیلە؛ گوشت بی‌استخوان

**شەریعەت / şerî'et/**: ☜ **شەرع ـ١**

**شەریف / şerîf/**: ئاوەڵناو. خاوەن‌ئابڕوو؛ بەشەرەف ☰ شریف

**شەریک / şerîk/**: ناو. ١. هەواڵ؛ هاوڕێ ٢. هاوبەش لە ماڵدا ☰ ١. دوست ٢. شریک

**شەریکایەتی / şerîkayetî/**: ناو. شەریکی؛ هاوبەشی ☰ شراکت

**شەریکە / şerîke/**: ناو. بنکەی هاوبەشی لە بازرگانیدا ☰ شرکت تجارتی

**شەریکەدز / şerîkediz/**: ناو. دەسکیس؛ دایکەدزە ☰ دزد افشار

**شەریکی**[1] **/ şerîkî/**: ناو. هاوبەشی؛ هەڤپشکی؛ بارودۆخی تێکەڵ و پێکەوە بوون: ئا) لە کردنی کارێکدا ب) لە کەڵک وەرگرتن لە شتێکدا ☰ شراکت

**شەریکی**[2]: ئاوەڵناو. هاوبەش ‹باخی شەریکی› ☰ مشترک‌المنافع

**شەریکی**[3]: ئاوەڵکار. وەک یەک؛ بە هاوبەشی ‹وەرە با ئەو ماڵە شەریکی بستێنین› ☰ شراکتی

**شەڕ**[1] **/ şeř/**: ناو. ١. جەنگ؛ کار و کردەوەی پێکدادانی دوو لەشکر یان دوو وڵاتی دژ بە یەک ‹شەڕی ئێران و عێراق› ٢. داوا؛ ئاکارێک کە نیشانەی ناکۆکی یان دژمنایەتی نێوان دوو کەس یان دوو دەستەیە ‹لەسەر میرات بوو بە شەڕیان!› ٣. وەی؛ خراپی؛ بەدی؛ نەگبەتی؛ بەلا؛ خراوی ‹شەڕی ئەم نەخۆشییەم لە کۆڵ ناکەوێ!› ☰ ١.

جنگ ٢. دعوا ٣. شر

▣ **شەڕی خۆ ترزین:** /پلار/ شـەڕێ کـە گـران بـێ و پێت نەکرێ؛ کار و ڕەوتی خۆ تووشـی شـەڕی قورس کـردن و تێیـدا چـەقین ☰ جنگـی کـە عواقبش به خود طرف برگردد

▣ **شەڕ بوون:** جەنگ و داوا لە گەڕدا بوون ☰ جنگ و دعوا شدن

**شەڕ پێ فرۆشتن:** ☜ **شەڕ پێ کردن ـ١**

**شەڕ پێ کردن:** ١. شەڕ پێفرۆشتن؛ تووشی شەڕ کردن ٢. بە شتێ شەڕ کردن؛ کردنـە ئـامرازی شەڕ ☰ ١. دامنگیر جنگ و دعوا کردن ٢. بـه کـار گرفتن برای جنگ و دعوا

**شەڕ داگرسان:** جەنگ سەرهەڵدان ☰ جنگ شدن

**شەڕ فرۆشتن/ فرۆتن:** ١. ئاژاوە نانـەوە ٢. پەڵـپ گرتن ☰ ١. شر به پا کردن ٢. بهانه گرفتن

**شەڕ کردن:** جەنگ کردن ☰ جنگیدن

**شەڕ کوژانەوە:** جـەنگ کۆتـایی هـاتن ☰ جنـگ فروکش کردن

**شەڕ نانەوە:** ئاژاوە نانەوە ☰ فتنه برپا کردن

**شەڕ هەڵگیرساندن:** ١. شەڕ ڕێخسـتن ٢. ئـاژاوە گێڕان. هەروەها: **شەڕ هەڵگیرسان** ☰ ١. جنـگ راه انداختن ٢. شر به پا کردن

**بوونە شەڕ:** شەڕ بەرپا بوون ‹تێکگیران و بوو بـە شەڕێک مەپرسە!› ☰ جنگ شدن

**بە شەڕ(دا) دان:** بوونە هۆی شەڕ کـردن ☰ بـذر جنگ و دعوا افکندن

**بە شەڕ هـاتن:** کردنە شـەڕ ☰ جنـگ و دعـوا راه انداختن

**تووشی شەڕ هاتن:** ١. کەوتنە نـاو داوی شـەڕەوە ٢. تووشی گێچەڵ و کێشـە بـوون ☰ ١. در دام جنگ افتادن ٢. دامنگیر آشوب شدن

**شەڕ**[2]: ناوەڵناو. بشـێوونە؛ ئاژاوەگێـڕ؛ سەرسـوودەرە؛ جـووتقۆشـە؛ هـۆی زەحمـەت و دەردیسـەر ‹کابرایەکی شەڕە، بـۆ هـەر کـوێ دەڕوا خەڵـک لـە دەستی ئامانیان نییە› ☰ شر؛ مایەی جنگ و آشوب

**شەڕ**[3]: پێشوشە. جەنگ؛ داوا ‹شەڕخواز؛ شـەڕفرۆش› ☰ جنگ؛ دعوا

ـ **شەڕ**[4]: پاشەوشە. شەڕە ‹بەرانشەڕ؛ کەڵەشێرشەڕ› ☰ جنگِ

**شەڕئاخێز** / şeřaxêz/: ☜ **شەڕهەڵایسێن**

**شەڕا** / şeřa/: ☜ **شەرا**

**شەڕاب** / şeřab/: ☜ **شەراب**

**شەڕابردگ** / şeřabirdig/: ☜ **شەرابردوو**

**شەڕابردوو** / şeřabirdû/: ☜ **شەرابردوو**

**شەڕابردە** / şeřabirde/: ☜ **شەرابردوو**

**شەڕابە** / şeřabe/: ☜ **شۆڕابە ـ١**

**شەڕاشۆ** / şeřaşo/: ناوەڵناو. شـەڕانی؛ شـەڕفرۆش؛ شەڕۆڵ؛ جینگن؛ جنگن؛ جەنگخواز. هـەروەها: **شەڕاشۆیی** ☰ ستیزەجو

**شەڕالێدراو** / şeřalêd(i)raw/: ☜ **شەرابردوو**

**شەڕانخێوی** / şeřanxêwî/: ☜ **شەرانخێوی**

**شەڕانی** / şeřanî/: ☜ **شەڕاشۆ**

**شەڕاییسێن** / şeřayîsên/: ☜ **شەڕهەڵایسێن**

**شەڕبەشاران** / şeřbeşaran/: ناوەڵناو. ئـاژاوەچی ☰ فتنەانگیز

**شەڕبەشان** / şeřbeşan/: ناوەڵناو. قـوونبەگێچـەڵ؛ ئاژاوەچی؛ بشێونە ☰ فتنەانگیز

**شەڕخۆشکەر** / şeřxoşker/: ناوەڵناو. ئاگرخۆشکەرە؛ تایبەتمەندی کەسێ کە بە شۆفاری کردن، شـەڕ و ناکۆکی زۆرتر دەکا ☰ آتشبیار

**شەڕفرۆش** / şeřf(i)roş/: ناوەڵناو. ١. ☜ **شەڕاشـۆ** ٢. بیانووگر ☰ ١. ☜ **شەڕاشۆ** ٢. بهانەگیر

**شەڕڤان** / şeřvan/: ناو/ ناوەڵناو. شەڕکار؛ شـەڕکەر؛ چەکداری بەشدار لە شەڕدا. هـەروەها: **شەڕڤـانی** ☰ جنگاور

**شەڕکار** / şeřkar/: ☜ **شەڕڤان**

**شەڕکاری / şeřkarî/**: ناو. شەڕڤانی؛ شەڕوانی 🇮🇷 جنگاوری

**شەڕکەر / şeřker/**: ☜ شەڕڤان

**شەڕگە / şeřge/**: ناو. مەیدانی جەنگ 🇮🇷 رزمگاه؛ میدان جنگ

**شەڕلاتان / şeřlatan/**: ☜ شارلاتان

**شەڕلاوەلا / şeřlawela/**: ناوەڵناو. شەڕهەڵگیرسێن؛ ئاژاوەچی 🇮🇷 فتنەانگیز

**شەڕناخێوی / şeřnaxêwî/**: ☜ شەرانخێوی

**شەڕواز / şeřwaz/**: ناوەڵناو. گرۆبەندە؛ زۆر ئازا لە شەڕدا 🇮🇷 جنگاور

**شەڕوکێشە / şeř û kêşe/**: ناو. شەڕ و ناکۆکی 🇮🇷 جنگ و دعوا

**شەڕۆڵ / şeřoł/**: ☜ شەڕاشۆ

**شەڕە -/ -şeře/**: ناو. جەنگ و پێکدادان ‹شەڕەجنێو؛ شەڕەقسە؛ شەڕەچەقۆ› 🇮🇷 جنگ و دعوا

**شەڕەبا / şeřeba/**: ناو. دۆخی پێکەوە هاتنی شەماڵ و زریان بە توندی 🇮🇷 حالت وزیدن باد شمال و جنوب با هم

**شەڕەبەران / şeřeberan/**: ناو. ١. بەرانشەڕ؛ شەڕی دوو بەران پێکەوە ٢. /کینایە/ دۆخی تێکهەڵچرژانی دوو پیاوی کەڵەگەت 🇮🇷 ١. جنگ دو قوچ ٢. حالت گلاویز شدن دو تنومند

**شەڕەبەرد / şeřeberd/**: ناو. پەڵپەلان؛ تەوەنەفرێ 🇮🇷 سنگ‌پرانی

**شەڕەبەفر / şeřebefr/**: ☜ تۆپەڵەشەڕی

**شەڕەبەق / şeřebeq/**: ناو. شەڕی دوو یا چەند بەق پێکەوە 🇮🇷 جنگ دو یا چند کبک نر

**شەڕەپشیلە / şeřep(i)şîle/**: ناو. ١. ڕەوتی بە شەڕ هاتنی پشیلان پێکەوە ٢. /کینایە/ خەتی زۆر ناخوش و تێکەڵ-پێکەڵ 🇮🇷 ١. جنگ گربەها ٢. خط خرچنگ ـ قورباغه

**شەڕەپۆپان / şeřepopan/**: ناو. شەڕەپۆپە؛ چنگەپرچەی ژنان 🇮🇷 جدال زنانه

**شەڕەپۆپە / şeřepope/**: ☜ شەڕەپۆپان

**شەڕەپێلاقە / şeřepêlaqe/**: ناو. قاچەشەرمەکێ 🇮🇷 لگدبازی

**شەڕەتۆپ / şeřetop/**: ناو. ١. شەڕ بە تۆپی چەک ٢. ☜ شەڕەتۆپەڵ 🇮🇷 ١. جنگ توپخانە ٢. ☜ شەڕەتۆپەڵ

**شەڕەتۆپەڵ / şeřetopeł/**: ناو. شەڕەتۆپ؛ تۆپەڵەشەڕێ؛ گەمەی بە تۆپەڵەبەفر بۆ یەکتر خستن 🇮🇷 بازی با گلولەی برف

**شەڕەجنێو / şeřec(i)nêw/**: ناو. شەڕەجوێن؛ کاری جنێو پێکدان 🇮🇷 عمل دُشنام به هم دادن

**شەڕەجوێن / şeřec(i)wên/**: ☜ شەڕەجنێو

**شەڕەچنگ / şeřeçing/**: ناو. چنگەپلماسێ؛ کاری هاشاوڵ بردن بە پەنجە و چنگ گرتن 🇮🇷 دفاع با چنگ و دندان

**شەڕەچەقۆ / sereçeqo/**: ناو. کاری بە چەقۆ بە شەڕ هاتن 🇮🇷 چاقوکشی

**شەڕەچەقە / sereçeqe/**: ناو. تووڕەیی و قیرە و هەرا بە سەری یەکتردا 🇮🇷 مُشاجره

**شەڕەخەنجەر / şeřexencer/**: ناو. کاری بە خەنجەر لێکدان 🇮🇷 خنجرکشی

**شەڕەدندوک / şeředindûk/**: ☜ شەڕەدندوکە

**شەڕەدندوکە / şeředindûke/**: ناو. /پ‌لار/ شەڕەدندووک؛ شەڕەدەندووکە؛ شەڕەدەندووکێ؛ کاری بە پرتە و بۆڵە دە گژ یەک ڕاچوون 🇮🇷 دعوای لفظی

**شەڕەدەندوکە / şeředendûke/**: ☜ شەڕەدندوکە

**شەڕەدەندوکێ / şeředendûkê/**: ☜ شەڕەدندوکە

**شەڕەزێرینگەرانە / şeřezêrîngeran/**: ناو. شەڕی درۆینە بۆ فریودانی کەسانی تر 🇮🇷 جنگ زرگری

**شەڕەژن / şeřejin/**: ناو. دۆخی بە شەڕ هاتنی ژنان پێکەوە 🇮🇷 دعوای زنان

**شەڕەسە** / şeřese/: ☜ **شەڕەسەگ**

**شەڕەسەگ** / şeřeseg/: ناو. شەڕەسە: ١. ڕەوتی بە شەڕ هاتنی سەگان ٢. *[پلار]* شەڕی بێ‌حەیایان ☰ ١. جنگ سگ‌ها ٢. دعوای کولی‌ها

**شەڕەشاخ** / şeřeşax/: ناو. قۆچ‌قۆچانی ‹شەڕەشاخی بزنانیش بەزمێکە› ☰ شاخ‌زنی

**شەڕەشان** / şeřeşan/: ناو. بەردەقی؛ کێبەرکێ بە شان لێکتر دان ☰ مسابقەی تنه‌زنی

**شەڕەشۆق** / sereşoq/: ☜ **شەڕەقۆچ**

**شەڕەشەق** / sereşeq/: ناو. ١. کاری بە پا لە یەکتر دان ٢. *[کینایە]* دنیای پڕ لە ئاژاوە و تێکەڵ‌ـپێکەڵی ‹هەیاران! من نزیکەی سی ساڵە دەژیم؛ ژیان هەر ئەو شەڕەشەق و کەربازاڕەیە کە دیومە «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ ١. لگدپرانی ٢. آشوب و درهم‌برهمی

**شەڕەف** / şeřef/: ☜ **شەرەف**

**شەڕەفڕ** / şeřefiř/: ناو. شەڕەجنێو و ناونیتکە هەڵدان بە گاڵتە و شیعر ☰ هجو شعری یکدیگر

**شەڕەقسە** / şeřeq(i)se/: ناو. شەڕی دەمی؛ دەمەقاڵە ☰ جنگ لفظی

**شەڕەقۆچ** / şeřeqoç/: ناو. شەڕەشۆق؛ ڕەوتی بە سەر و شاخ دە یەکتر دانی حەیوان ‹لە کوژەوە مرڕەی گورگ و ملچەی خوێن دێ/ هەتا کەنگێ گوێم لە زرمەی شەڕەقۆچی دوو بەران بێ؟! «پەشێو»› ☰ عمل شاخ به شاخ شدن حیوانات

**شەڕەقۆچەقانی** / şeřeqoçeqanî/: ناو. شەڕەقەڵماسک؛ شەڕ بە بەرەقانی ☰ جنگ با فلاخن

**شەڕەقەڵماسک** / şeřeqełmasik/: ☜ **شەڕەقۆچەقانی**

**شەڕەکەر** / şeřeker/: ناو. *[پلار]* شەڕی بێ هۆی دوو یان چەند کەسی تێنەگەیشتوو ☰ دعوای ابلهانه

**شەڕەکەڵ** / şeřekeł/: ناو. ڕەوتی لێکدانی دوو کەڵ؛ بە شەڕ هاتنی کەڵ ☰ جنگ گاومیش‌ها

**شەڕەکەڵەباب** / şeřekełebab/: ناو. شەڕەکەڵەشێر؛ ڕەوتی لێکدانی دوو کەڵەباب ☰ جنگ خروس‌ها

**شەڕەکەڵەشێر** / şeřekełeşêr/: ☜ **شەڕەکەڵەباب**

**شەڕەگ** / şeřeg/: ☜ **شاڕەگ**

**شەڕەگەڕەک** / şeřegeřek/: ناو. مەحەلەجەنگێ؛ پەڤچوونی دوو تاخ ☰ جنگ میان دو یا چند محلّه

**شەڕەمشت** / şeřemişt/: ناو. گۆڵەمەبازی؛ گولم‌لیزی ☰ بوکس

**شەڕەنگێز** / şeřengêz/: ئاوەڵناو. جەنگن؛ جەنگەرانی؛ ئاژاوەچی ☰ آشوبگر

**شەڕەون** / şeřewin/: ئاوەڵناو. قڕەون؛ شەڕانی؛ جەنگەرانی ☰ آشوبگر

**شەڕهۆمللێ** / şeřhomillê/: ناو. چەقە و شەڕ و هەرا ☰ جار و جنجال

**شەڕهەڵایسێن** / şeřhełaysên/: ☜ **شەڕهەڵایسێن**

**شەڕهەڵایسێن** / şeřhełayîsên/: ئاوەڵناو. شەڕهەڵایسێن؛ شەڕهەڵگرسێن؛ شەڕئاخێز؛ شەڕهەڵگیرسێن؛ شەڕهەڵخڕێن؛ شەڕاییسێن؛ ئاگرەگەشێ؛ جەنگن؛ بە توانایی یا واز لە هەڵگرساندنی ئاگری شەڕ ‹شەڕی ماڵوێرانکەری دووەم بە تێکشکانی فاشیزم و ... لە ناو چوونی شەڕهەڵایسێنەکان تەواو بوو «هێمن»› ☰ جنگ‌افروز

**شەڕهەڵخڕێن** / şeřhełx(i)řên/: ☜ **شەڕهەڵایسێن**

**شەڕهەڵگرسێن** / şeřhełgirsên/: ☜ **شەڕهەڵایسێن**

**شەڕهەڵگیرسێن** / şeřhełgîrsên/: ☜ **شەڕهەڵایسێن**

**شەز / şez/**: ناو. قرنوو؛ چنگنە؛ گەنەکەولە ☰ نوعی کنە

**شەس / şes/**: ناو. شەست: ١. هەست؛ هاس ٢. ڕەهێڵە؛ ڕێژنەبارانی توند ٣. جەنگەی بارانی بەهار ٤. قامکەگەورە؛ تلیامەزن ٥. شێست؛ ژمارەی دوای پەنجا و نۆ ☰ ١. احساس ٢. رگبار باران ٣. موسم باران‌های بهاری ۴. انگشت شست ۵. عدد شصت

⊡ **شەس کردن**: شەست کردن؛ بارینی بە ڕێژنە ‹باران شەس ئەکا چۆن بچین؟› ☰ رگبار گرفتن

**شەس‌بێدار / şesbêdar/**: ئاوەڵناو. بەئاگا؛ ئاگادار ☰ آگاه؛ باخبر

**شەسپەڕ / şespeř/**: ناو. شەستپەڕ؛ گوڵێکە ☰ گُل شصت‌پر

**شەست / şest/**: ☜ **شەس**

⊡ **شەست کردن**: ☜ **شەس کردن**

**شەستپەڕ / şestpeř/**: ☜ **شەسپەڕ**

**شەستە / şeste/**: ناو. ١. شەس؛ شەست؛ جەنگەی بارانی بەهاری ٢. کاری خەت دانی زەوی بۆ تووتن چەقاندن ☰ ١. موسم باران‌های بهاری ٢. عمل شیار زدن زمین برای کشت توتون

⊡ **شەستە کردن**: ١. بارینی بە ڕێژنە ٢. خەت دانی زەوی بۆ تووتن چەقاندن ☰ ١. رگبار باریدن ٢. شیار زدن زمین برای کشت توتون

**شەستەباران / şestebaran/**: ناو. ١. جەنگەی بارانی بەهار ٢. ڕێژنەی توند ☰ ١. موسم باران بهاری ٢. رگبار تند

**شەستەڕەهێڵە / şesteřehêle/**: ناو. ڕێژنە بارانی توند ☰ رگبار شدید باران

**شەستەم / şestem/**: ئاوەڵناو. شێستەم؛ بە ڕیز یان پلەی دوای پەنجاونۆیەم ☰ شصتُم

**شەستەمین / şestemîn/**: ئاوەڵناو. شەستەهەمین؛ شێستەمین؛ شەستەم ☰ شصتُمین

**شەستەهەمین / şestehemîn/**: ☜ **شەستەمین**

**شەستیر / şestîr/**: ناو. ڕەشاش؛ شێستیر ☰ آتشبار

**شەش[1] / şeş/**: ناو. شێش؛ ژمارەی سەرەکی دوای پەنج و پێش حەوت ☰ شش

**شەش[2]**: ئاوەڵناو. یەکێک زۆرتر لە پێنج ☰ شش

**شەش‌ئاگر / şeş'agir/**: ناو. شەشار؛ شەشدەرب؛ شەشلوول؛ جۆرێ دەمانچە ☰ ششلول

**شەش‌ئالی / şeş'alî/**: ناو. شەش لا؛ شەش لایەن ☰ شش جهت

**شەشا / şeşa/**: ☜ **شەشەم**

**شەشار / şeşar/**: ☜ **شەش‌ئاگر**

**شەشبەند / şeşbend/**: ناو. گای نۆساڵە ☰ گاو نُه ساله

**شەشبەندی / şeşbendî/**: ئاوەڵناو. فێڵباز؛ گزیکار؛ حیلەباز ☰ حیله‌گر

**شەشپاڵو / şeşpału/**: ناو. شەش‌گۆشە؛ شەش‌سووچ ☰ شش گوشه

**شەشپەڕ / şeşpeř/**: ناو. ١. جۆرێ تۆمی جۆ ٢. گیایەکی زۆر شینە و زۆرتر لە گۆڕستانی دەنێژن ☰ ١. نوعی جو ٢. گُل شصت‌پر

**شەشترنگە / şeşt(i)ringe/**: ناو. چێشتێکە ☰ آشی است

**شەشخان / şeşxan/**: ناو. شەشخانە: ١. جۆرێ تفەنگ ٢. ساپساپانێ؛ شەخشان؛ خەت‌بازی؛ یارییەکی منداڵانە بە لەتێک سواڵەت یان بەردی تەخت لە سەر زەوی دەکرێ ☰ ١. نوعی تفنگ ٢. اکردوکر

**شەشخانە / şeşxane/**: ☜ **شەشخان**

**شەش‌دانگ[1] / şeşdang/**: ناو. ١. تێکڕایی ملک ٢. ئێستری پشت پان و چوارپەل قەوی ☰ ١. شش دانگ ملک ٢. استر قوی و تنومند

**شەش‌دانگ[2]**: ئاوەڵناو. بێ کەم‌وکوڕی؛ تەواوی تەواو ‹کەپرەکەمان خوەی ماڵێ شەشدانگە!› ☰ کامل؛

تمام‌عیار

**شەش‌دانگ**[۲]: ئاوەڵکار. بەتەواوی؛ سەرلەبەر ‹ئاوایییەکەمانی شەشدانگ سەند› ☰ تمام و کمال

**شەشدەر** / şeşder/: ناو. ۱. شەش ئالی (پێش و پاش، سەر و ژێر، ڕاست و چەپ) ۲. شەش خانی هەرکام لە چوار پاژی کایەی نەردین ۳. دۆخی هەر شەش خان گیران لە کایەی نەردیندا ‹کەردەن وە شەشدەر داشەکەی ڕۆحم/ وە دوو شەش بەستەن ڕاگەی فتۆحم «مەولەوی»› ☰ ۱. شش جهت ۲. ششدر نرد ۳. حالت ششدر شدن

▣ **شەشدەر (لێ) گیران**: شەشخان (لێ) بەسران: ۱. گیرانی هەر شەش خان و ڕێ دەرباز بوون بۆ نەمان لە نەردیندا ‹شەشدەرم گیراوە، مەشغوولم بە دەستی نەردەوە «تاهیر بەگ»› ۲. *[کینایە]* کەوتنە تەنگانەوە ☰ ۱. ششدر شدن ۲. راه پس و پیش نماندن

**شەش‌دەرب** / şeşderb/: ☜ **شەش‌ئاگر**

**شەشدەم** / şeşdem/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* زۆربڵێ و چەنەوەر ☰ وراج

**شەشدەور** / şeşdewr/: ☜ **شەش‌لا**

**شەش‌سووچ** / şeşsûç/: ناو. شەشپاڵوو؛ شەش‌گۆشە ☰ شش‌گوشه

**شەشسەد**[۱] / şeşsed/: ناو. ژمارەی سەرەکی پاش ۵۹۹ و پێش ٦۰۱ ☰ ششصد

**شەشسەد**[۲]: ئاوەڵناو. یەکێک زۆرتر لە ۵۹۹ ☰ ششصد

**شەشسەدەم** / şeşsedem/: ئاوەڵناو. بە ڕیز، پێگە یان جێگەی شەشسەدەوە ☰ ششصدُم

**شەشسەدەمین** / şeşsedemîn/: ئاوەڵناو. بە ڕیز، ڕزن، پێگە یان جێگەی شەشسەدەمەوە ☰ ششصدمین

**شەش‌قامک** / şeşqamik/: ☜ **شەشە**

**شەشک** / şeşik/: ناو. ۱. ☜ **شەشەڵان ـ۲** ۲. شاشک؛ مێزەر؛ سەرووپێچ ☰ ۱. ☜ **شەشەڵان ـ۲**

۲. دستار

**شەشکان** / şeşkan/: ☜ **شەشەڵان ـ۲**

**شەش‌کلک** / şeşkilk/: ☜ **شەشە**

**شەشگۆشە** / şeşgoşe/: ناو. شەشپاڵوو؛ نژمێ کە لە شەش لقی وێک‌هاتوو پێک دێ و شەش سووچی هەیە ☰ شش ضلعی

**شەش‌لا** / şeşla/: ناو. شەش‌ئالی؛ شەشدەور ☰ شش جهت

**شەشلول** / şeşlûl/: ☜ **شەش‌ئاگر**

**شەشڵە** / şeşłe/: ناو. دوازدە ڕۆژ لە چلەی زستان، لە چوارەوە تا شازدەی ڕێبەندان ☰ روزهای چهارم تا شانزدهم بهمن ماه

**شەشۆ** / şeşo/: ☜ **شەشە**

**شەشە** / şeşe/: ئاوەڵناو. شەش‌کلک؛ شەشۆ؛ شەشەک؛ شەش‌قامک؛ شەنگۆلە؛ خاوەنی شەش قامک لە دەست یان پێدا ☰ شش‌انگشتی

**شەشەک** / şeşek/: ناو. ۱. ☜ **شەشە** ۲. ☜ **شەشەڵان ـ۲**

**شەشەکان** / şeşekan/: ☜ **شەشەڵان**

**شەشەڵان** / şeşełan/: ناو. شەشەکان: ۱. شەوال؛ مانگی دەیەمی کۆچی ـ مانگی کە دوای ڕەمەزانە ۲. شەشک؛ شەشکان؛ شەشەک؛ شەش ڕۆژی دوای جێژنی ڕەمەزان ☰ ۱. ماه شوال ۲. شش روز بعد از عید فطر

**شەشەم** / şeşem/: ئاوەڵناو. شەشا؛ بە ڕیز، ڕزن یان پلەی شەشەوە ☰ ششُم

**شەشەمین** / şeşemîn/: ئاوەڵناو. شەشهەمین؛ دوای پێنجەمین ☰ ششُم

**شەشەیی** / şeşeyî/: ناو. *[باوەڕی کۆن]* شەڤە؛ ئال؛ هال؛ جندۆکەی خەیالی دژی ژنی زەیسان ☰ آل

**شەشهەمین** / şeşhemîn/: ☜ **شەشەمین**

**شەش‌یەک** / şeşyek/: ناو/ ئاوەڵناو. لە شەش پاژ پاژێک ☰ یک‌ششُم

**شەش‌یەکی / şeşyekî/**: ناو/ ناوەلناو. شەش‌یەک لە کەلەپووڕ ☰ یک ششم ارث

**شەعر / şe'r/**: ناو. دەسرۆکەی حەریری سەرپێچی ژن و پیاوان ☰ سرپوش حریر مردانه و زنانه

**شەعف / şe'f/**: ناو. پرچ؛ بسک ☰ زُلف

**شەعموز / şe'mûz/**: ☜ شەمبوز

**شەعن / şe'n/**: ناو. بزنی بەلەک ☰ بُز خلنگ

**شەغرە / şeğre/**: ناو. شـخرە؛ شـفرە؛ شـەخرە؛ شـەقەل؛ کـێش: ١. بارەگیـای سـەر چـاروا ٢. بیست باقە گیا ☰ ١. یک بار گیاه بر پشت ستور ٢. بیست دسته گیاه

**شـەغرەکێش / şeğrekêş/**: نـاو. شـخرەکێش؛ شەخرەکێش؛ داری بن بارەگیا کـە سـەر پشـتی بارەبەری دەخەن ☰ چوب‌های زیر بار گیاه بر پشت باربر

**شەغلەمە / şeğleme/**: ناو. دەنگەدەنگ؛ قرموقـاڵ ☰ سر و صدای زیاد

**شەف / şef/**: ☜ شەو

**شەفاعت / şefa'it/**: ☜ شفات

**شەفت[1] / şeft/**: ناو. شافت؛ قورم؛ شڤک؛ دەسـتک؛ شڤاک؛ میلەیەک کە پوولی، چـەرخ دەنـدە یـان بولبرینگی لە سـەر دادەنرێ و جوولـە و خـولی ماشێن لە بەشێکەوە دەداتە بەشێکی‌تر ☰ شافت

**شەفت[2]**: ☜ شەفتور[2]

**شەفتا / şefta/**: ☜ شەوتا

**شەفتاری / şeftarî/**: ناو. شەفـتاری؛ شەفـڕەش؛ شەوی تاریک و بێ‌تریفەی مانگ ☰ دیجور؛ شـب تاریک

**شەفتالو / şeftalû/**: نـاو. شـەفتالی؛ شـەفتەلی؛ هەشتالوو؛ هەشتالوێ؛ قـۆخ؛ قـۆخی؛ خـۆخ: ١. دارێـک بـە توێکلـی قـاوەیی ڕۆشـن، گـەڵای درێژووکە یان نووسکن و گوڵی تاک کـە بـەر لـە وەچ دەردێ ٢. بەری خـۆراکی، خـڕ و گۆشـتنی ئەو دارە ☰ ١و٢. هُلو

**شەفتالی / şeftalî/**: ☜ شەفتالو

**شەفتر / şeftir/**: ناو. پێرێشەو؛ پێرەشەو ☰ پریشب

**شـەفتور[1] / şeftûr/**: ناوەلـناو. شـەتوور؛ شـەفت؛ شەفتوول: ١. لار؛ گێر ٢. خواربـڕدراو؛ قیلـەوقاچ ☰ ١. أریب ٢. کج بُریده

**شەفتور[2]**: ناوەلکار. شەفتوول؛ شـەتوور؛ لار؛ گێـڕ؛ لارەولار ‹شەفتوور ببڕە!› ☰ أریب

**شەفتوربڕ / şeftûrbiř/**: ناوەلناو. فارسی‌بڕ؛ بڕشـتی شەفتوور ☰ فارسی‌بُر

**شەفتول / şeftûl/**: ☜ شەفتور

**شەفتەلی / şeftelî/**: ☜ شەفتالو

**شەفتی / şeftî/**: ناو. چـەوتی؛ لاری (لـە بڕینـدا) ☰ کجی (در بُرش)

**شەفەلاح / şefelaĥ/**: نـاو. ١. شەفەلە؛ بـەری داری کفـر ٢. مەلێکـە ☰ ١. ثمـر درختچـه‌ای اسـت ٢. پرنده‌ای است

**شەفەلە / şefele/**: نـاو. ١. ☜ شـەفەلاح ـ١ ٢. مارچێوە ☰ ١. ☜ شەفەلاح ـ١ ٢. مارچوبه

**شەڤ[1] / şev/**: ☜ شەو

**شەڤ[2]**: ناوەلناو. لار؛ چەوت؛ خوار ☰ خمیده؛ کج

**شەڤارە / şevare/**: ☜ شەوارە

**شەڤاڕە[1] / şevaře/**: نـاو. خەلـفی تـازە و شـلک و تێراو ☰ جوانەی تُرد و شاداب

**شەڤارە[2]**: ناوەلناو. *[مەجاز]* زۆر درێژ ☰ بسیار بلند

**شەڤانە[1] / şevane/**: نـاو. ١. کرێی ئێشـک گـرتنی حەسەس ٢. کاری هۆندنەوەی شـیعر ☰ ١. مُزد عسس ٢. عمل سرودن شعر

**شەڤانە[2]**: ناوەلناو/ ناوەلکار. شەوانە ☰ شبانه

**شەڤبشکێڤ / şevbişkêv/**: ناو. لیلووپەڕ؛ نیلووفـەڕ ☰ نیلوفر

**شەڤبشکێڤک / şevbişkêvik/**: ناو. گیایەکە بە شەو گوڵ دەکا و بە ڕۆژ دەپووچێتـەوە ☰ گلـی کـه در

شب می‌شکفد

**شەڤبۆ** / şevbo/: ☜ شەوبۆ

**شەڤبۆری** / şevborî/: ☜ شەونشینی

**شەڤبێهن** / şevbêhin/: ناو. گوڵێکە جگە لە شەوبۆ کە بە شەو بۆنی هەیە ☰ گلی است

**شەڤپەست** / şevpest/: ناو. مۆتە؛ مۆتەکە ☰ کابوس

**شەڤتا** / şevta/: ☜ شەوتا

**شەڤتاری** / şevtarî/: ☜ شەفتاری

**شەڤترادی** / şevt(i)radî/: ناو. بەسرپێرێشەو؛ پەسرپێرەشەو ☰ پس‌پریشب

**شەڤخشت** / şevxişt/: ناو. شەڤخشک؛ کالیار؛ ترۆزی درێژ و ئەستوور بۆ تۆم ☰ خیارچنبر بزرگ

**شەڤخشک** / şevxişk/: ☜ شەڤخشت

**شەڤخونی** / şevxûnî/: ☜ شەوخونی

**شەڤدەر** / şevder/: ناو. ١. مرۆ یان ئاژەڵێ کە شەو نایەتەوە ئاوایی ٢. ☜ شەوەر ☰ ١. انسان یا حیوانی که شب در صحرا است ٢. ☜ شەوەر

**شەڤرۆنک** / şevronik/: ناو. ١. جێژنێکی ئێزدییەکانە ٢. ☜ شەونشینی ☰ ١. یکی از جشن‌های مذهبی ایزدیان ٢. ☜ شەونشینی

**شەڤرەڤک** / şevrevik/: ☜ شەمشەمەکوێرە

**شەڤرەڤیک** / şevrevîk/: ☜ شەمشەمەکوێرە

**شەڤرەڤین** / şevrevîn/: ☜ شەمشەمەکوێرە

**شەڤرەوین** / şevrewîn/: ☜ شەمشەمەکوێرە

**شەڤڕۆ** / şevřo/: ناو. کەسێ بە شەو سەفەر دەکا ☰ شبرو

**شەڤڕەش** / şevřeş/: ☜ شەفتاری

**شەڤڕەشک**[1] / şevřeş(i)k/: ناو. ١. فکر و خەیاڵ؛ ساویر؛ خەیالات ٢. نەخۆشییەکی مریشکە پێ کوێر دەبێ ☰ ١. خیالات ٢. از بیماری‌های مُرغ خانگی

**شەڤڕەشک**[2]: ئاوەڵناو. شەڤکۆر؛ شەوکوێر. هەروەها: شەڤرەشکی ☰ شبکور

**شەڤڕەڤیک** / şevřevîk/: ☜ شەمشەمەکوێرە

**شەڤڕەڤین** / şevřevîn/: ☜ شەمشەمەکوێرە

**شەڤڕەڤینک** / şevřevînik/: ناو. ١. ☜ شەونشینی ٢. ☜ شەمشەمەکوێرە

**شەڤشەڤۆک** / şevşevok/: ☜ شەمشەمەکوێرە

**شەڤکار** / şevkar/: ☜ شەوکار

**شەڤکری** / şevk(i)rî/: ناو. شوول کرن بشەڤ؛ کاری شەوانە ☰ کار شبانه

**شەڤکۆر**[1] / şevkor/: ☜ شەمشەمەکوێرە

**شەڤکۆر**[2]: ☜ شەوکوێر

**شەڤکۆری** / şevkorî/: ☜ شەوکوێری

**شەڤگور** / şevgur/: ناو. بوومەلێڵە؛ بوولێڵە؛ سووز؛ تاریک‌وروونی بەیانی ☰ گرگ‌ومیش اول بامداد

**شەڤگەڕ**[1] / şevgeř/: ناو. شەڤگێڕ: ١. ئێشکچی شەوانە ٢. *[کینایە]* مرۆی ئازا ٣. جۆرێ مارمێلکی ماڵی ☰ ١. نگهبان شب ٢. آدم شجاع ٣. نوعی مارمولک خانگی

**شەڤگەڕ**[2]: ئاوەڵناو. شەڤگێڕ؛ تایبەتمەندی کەسێ کە لە خەودا ئەگەڕێ و لە ناو جێگە نامێنێ ☰ مُبتلا به شبگردی در خواب

**شەڤگەش** / şevgeş/: ناو. گوڵێکە لە شەودا دەپشکوێ و بە ڕۆژ دەپووچێتەوە ☰ گلی است

**شەڤگێڕ** / şevgêř/: ☜ شەڤگەڕ

**شەڤنم** / şevnim/: ☜ شەونم

**شەڤنەم** / şevnem/: ☜ شەونم

**شەڤۆک** / şevok/: ئاوەڵناو. شەوفڕ؛ تایبەتمەندی ئەو باڵدارانەی بە شەو ناخەون (وەک کوند و توتاک و گۆین) ☰ شب‌بیدار (پرنده)

**شەڤو** / şevû/: ناو. وزەی مەعنەوی ☰ نیروی معنوی

**شەڤە** / şeve/: ناو. ١. ☜ شەشەیی ٢. ☜ شەوە

**شەڤەرۆک / şeverok/**: ناو. زبارەی ساوار کوتان ☰ بلغورکوبی تعاونی

**شەڤهەری / şevherî/**: ☜ شەونشینی

**شەڤی**[1] / **şevî/**: ناو. ١. ☜ شەوێن ٢. ☜ شۆبە-٢

**شەڤی**[2]: ئاوەڵناو. ١. ☜ شەومەنە ٢. چەماو؛ خوارەوەبوو ☰ ١. ☜ شەومەنە ٢. خمیده

**شەڤین**[1] / **şevîn/**: ☜ شەوێن

**شەڤین**[2]: ئاوەڵناو. ١. چەماوە؛ خوارەوەبوو ٢. ڕەش وەک شەو ☰ ١. خمیده ٢. سیاه

**شەڤیە / şevye/**: ناو. شەواژۆ؛ لەوەڕاندنی مێگەل بە شەو ☰ عمل چرانیدن گله در شب

**شەق**[1] / **şeq/**: ناو. ١. شاق؛ کاری لێ دان بە پشتی پێ ٢. زللە؛ زیلە؛ شەقەزلە ٣. گۆچانی گۆبازی ٤. چۆنیەتی لە خەت دەرچوونی گاجووت ٥. شە؛ کەڵکیت؛ کەرکیت؛ دەفەی جۆلایی ٦. درز؛ دەرز؛ تلیش ٧. چێوشەق؛ چێوشەقە؛ داری بن باخەڵی شەل ☰ ١. تیپا ٢. سیلی ٣. چوگانِ گوی‌بازی ۴. انحراف گاو از خط شخم ۵. دفته؛ از ابزار بافندگی ۶. شکاف؛ تَرَک ۷. چوب زیربغل

▣ **شەق بردن**: ١. هەڵتلیشان؛ داتلیشان ٢. لەبەریەک چوون ٣. *[کینایە]* تووڕە بوونی زۆر ☰ ١. ترک برداشتن ٢. از هم وا رفتن ٣. از خشم ترکیدن

**شەق پێدا دان**: ١. تێهەڵدان؛ شەق لێ دان ٢. *[کینایە]* بە هیچ نەزانین و فڕێ دان ☰ ١. تیپا زدن ٢. پُشت‌پا زدن

**شەق تێهەڵدان**: شەپ تێهەڵدان ☰ تیپا زدن

**شەق وەشاندن**: شەق وەشانن: ١. تێهەڵدان؛ شەپ لێ دان ٢. *[کینایە]* کاری وا کردن کە کەسێکی پێ دڵگران بێ ☰ ١. تیپا زدن ٢. عملی برخورنده (به کسی) انجام دادن

**دانە بەر شەق**: لە پەستا شەق تێهەڵدان ☰ پشتِ هم تیپا زدن

**شەق**[2]: ئاوەڵناو. ١. شڕ؛ نارەحەت ‹حاڵم شەقە› ٢. تورت و تێراو ٣. ڕەپ و ڕاست. ٤. سست و تێکشکاو ٥. گەورە و ناڕێک ‹کەوشەکانم شەقە› ☰ ١. پریشان ٢. تُرد و شاداب ٣. رُک و صریح ۴. سُست و درهم شکسته ۵. گُشاد و ناميزان

▣ **شەق بوون**: ١. تلیش بردن؛ درز تێ کەوتن ‹کاڵەکەکە لە شیرینی خۆیدا شەق بووە› ٢. تێپەڕ بوون ‹شەوگار شەق بوو› ٣. زل/ گەورە بوون (کەوش) ☰ ١. شکافتن ٢. سپری شدن ٣. بزرگ بودن (کفش)

**شەق کردن**: ١. دوو لەت کردن ‹وەنەوشەم ئەچنی، پەنجەم دا لە گوڵ/ شەوگارم شەق کرد، نەگەییم بە دڵ «فولکلۆر»› ٢. چەند پارچە کردن ‹ئەو شووتییە شەق کە بیخۆین› ☰ ١. دو نیم کردن ٢. چند پاره کردن

**شەق**[3]: دەنگ. دەنگی بەرز و لەنکاوی شکان و لێکدرانی شتێک (وەک: دار، پێوەدانی درگا) ☰ شَتَرَق

**. شەق**[4]: پاشەوشە. سەخت و ڕەق ‹کەللەشەق› ☰ ـ شق

**شەقار**[1] / **şeqar/**: ناو. شقار: ١. شوێن و لەلە ٢. شقاق؛ شەق و قەڵشتی کۆم ☰ ١. شیار ٢. شِقاق

**شەقار**[2]: ئاوەڵناو. شقار؛ لەت؛ دڕاو ☰ پاره و دریده

**شەقار . شەقار / şeqar şeqar/**: ئاوەڵناو. بزڕ- بزڕ؛ لەت ـ لەت ☰ پاره ـ پاره

**شەقازللە / şeqazille/**: ☜ شەپەزلە

**شەقازلە / şeqaz(i)le/**: ☜ شەپەزلە

**شەقاشەق / şeqaşeq/**: ناو. ئێرە و ئەوێ؛ ئەیرە و ئەینە ☰ این طرف و آن طرف

**شەقاقلوس / şeqaqlûs/**: ناو. ڕەشە؛ سەقاملووس؛ نەخۆشی مەرگی بەشێک لە شانەگەلی لەش بە هۆی پێ نەگەیشتنی خوێن، کوتران یان چڵک

کردن 🇮🇷 قانقاریا

**شەقال / şeqal/:** ☜ **شەکال**

**شەقام / şeqam/:** ناو. ١. خیابان؛ جادە؛ ڕێگای هات‌وچۆی ماشین و خەڵک لە شاران ٢. زیلە؛ زللە ٣. هەنگاو؛ هەنگاف 🇮🇷 ١. خیابان ٢. سیلی ٣. گام

**شەقان / şeqan/:** ☜ **شاقۆبانێ**

**شەقاندن / şeqandin/:** چاوگ. ڕکە کردن؛ کێبەرکێ کردن لە غاردانا 🇮🇷 مسابقەی دو دادن

**شەقانشەق / şeqanşeq/:** ئاوەڵکار. سەرانسەر؛ لەم سەر تا ئەو سەر 🇮🇷 سراسر

**شەقانێ / şeqanê/:** ناو. ١. شەقاوشەق؛ شەپ‌شەپان؛ شەپ‌شەپانە ٢. شەپانێ؛ تۆپان ٣. ☜ **شاقۆبانێ** 🇮🇷 ١. تیابازی ٢. توپ‌بازی (با پا) ٣. ☜ **شاقۆبانێ**

**شەقاو / şeqaw/:** ناو. ١. هەنگاوی زل ‹خۆ ئەگەر سەعاتێکیش هەڵێم، جندۆکە بە دوو شەقاو دەمگاتێ «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. شەقام؛ خیابان 🇮🇷 ١. گام بُلند ٢. خیابان

⊡ **شەقاو نان:** شەقاو هاویشتن؛ هەنگاو نان؛ پا گواستنەوە لە زەوی 🇮🇷 گام برداشتن/ نهادن

**شەقاو هاویشتن:** ☜ **شەقاو نان**

**شەقاوپیل / şeqawpîl/:** ئاوەڵناو. ڕاست؛ ڕاستەوخۆ 🇮🇷 مُستقیم

**شەقاوشەق / şeqawşeq/:** ☜ **شەقانێ ـ١**

**شەقاوقوش / şeqawquş/:** ناو. باڵندەیەکە وەک سی وایە، گۆشتی دەخورێ 🇮🇷 پرنده‌ای است

**شەقتاندن / şeqtandin/:** چاوگ. بە درێژاییدا لەت کردن 🇮🇷 دونیم کردن از طول

**شەقتین / şeqtîn/:** چاوگ. ڕووشان؛ داڕووشان 🇮🇷 خراشیدن

**شەقران / şeqran/:** ☜ **شڵەقان**

**شەقراندن / şeqrandin/:** ☜ **شڵەقاندن**

**شەقژن / şeqjin/:** دەنگەناو. دەنگی شەق و هۆڕ 🇮🇷 صدای برخورد و شکستن

**شەقشەق[1] / şeqşeq/:** ئاوەڵناو. ١. زۆر تورت و تێراو ٢. لەت‌وکوت ‹لە بیرمە چۆن خەڵکی بێ‌دەرەتان و لێقەوماویان بە شیران شەق‌شەق دەکرد «هێمن»› 🇮🇷 ١. بسیار تُرد و شاداب ٢. تکه‌پاره

**شەقشەق[2]:** دەنگەناو. دەنگی ددان وێک‌کەوتن 🇮🇷 صدای بهم خوردن دندان‌ها

**شەقشەقە / şeqşeqe/:** ناو. ١. خڕخاشە؛ جغجغە ٢. گیایەکە، تۆی گوڵەکەی لە ناو قۆزاخەکەیدا وەک خرخاشەی منداڵ دەنگی دێ 🇮🇷 ١. جغجغه (اسباب‌بازی) ٢. گیاهی شبیه جغجغه

**شەقشەقێن / şeqşeqên/:** ناو. شەپ‌شەپێن 🇮🇷 تیابازی

**شەققە / şeqqe/:** ☜ **شەقە**

**شەقڵ / şeqł/:** ناو. ١. شقڵ؛ شەقڵە؛ مۆی دارین بۆ نیشانە کردنی خەرمان ٢. چاپ 🇮🇷 ١. مُهر چوبی خرمن ٢. چاپ

⊡ **شەقڵ شکان:** مۆر لە سەر لاچوون 🇮🇷 لاک و مهر شکسته شدن

**شەقڵ شکاندن:** ١. مۆر لە سەر ماڵینەوە ٢. *[کنایە]* لە پێش خەڵکا دەست بە کار کردن ٣. *[کنایە]* ئابڕوو بردن 🇮🇷 ١. مُهر از سر برداشتن ٢. قبل از دیگران اقدام کردن ٣. آبرو بردن

**شەقڵ کردن:** مۆر کردنی خەرمان 🇮🇷 مُهر به خرمن زدن

**شەقڵە / şeqłe/:** ☜ **شەقڵـ١**

**شەقنای / şeqnay/:** چاوگ. لەقاندن؛ لەق کردن 🇮🇷 سُست کردن

**شەقوبانێ / şequbanê/:** ☜ **شاقۆبانێ**

**شەق‌وپەق / şeq û peq/:** ئاوەڵناو. شەق‌وشۆق؛ لەت‌وکوت؛ پارچەپارچە 🇮🇷 لت و پار

**شەق‌وشڕ / şeq û şiř/:** ئاوەڵناو. ١. تێکچووی سست

و شل (بۆ کورسی و شتی دارین) ٢. حاڵ‌خراپ؛ کز و کەنەفت ٣. ناتەواو ‹بە تورکییەکی نیوە عەرەبی و کوردی شەق‌وشڕ دەستیان پێ‌کرد «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ ١. زهوار دررفتە ٢. پریشان احوال ٣. دست‌وپاشکسته

**شەق‌وشۆق**[1] / şeq û şoq/: دەنگەناو. تەقەتەق ☰ سر و صدای بسیار

**شەق‌وشۆق**[2]: ☜ **شەق‌وپەق**

**شەقوق** / şequq/: ناو. جۆرێ دارەبەن کە قەزوانی خراپ دەگرێ ☰ نوعی بوتەی نامرغوب درخت بنه

**شەق‌وهۆڕ** / şeq û hoř/: دەنگەناو. دەنگی زۆری شکان ☰ صدای شکستن‌های پیاپی

**شەقۆبانێ** / şeqobanê/: ☜ **شاقۆبانێ**

**شەقۆق** / şeqoq/: ناو. سووچ و قوژبن؛ گۆشە و کەنار ☰ گوشه و کنار

**شەقۆن** / şeqon/: ناو. کاری بە سەر تێهەڵدانی حەیوان؛ شاخ لێدان ☰ عمل شاخ زدن حیوان

**شەقە**[1] / şeqe/: ناو. شەققە: ١. لاجانگ؛ گێجەنە؛ بەشی سەرووی نێوان گوێ و چاو ٢. شەقەمشار؛ مشاری دوو کەسی ٣. کۆتەرەی بنەمێو ٤. نیو لاشە گۆشت ٥. چێوشەقە؛ داری بن هەنگڵی شەل ☰ ١. شقیقه ٢. ارّەی دونفره ٣. تنەی تاک ۴. شقەی گوشت ۵. چوب زیر بغل

◙ **شەقەی باڵ**: [کنایە] کاری فڕینی بە پەلەی باڵدار ☰ عمل بال زدن سریع پرنده

◙ **شەقە کردن**: ١. دوو لەت کردن ٢. یەکجار وەڕەز بوون و هیچ لە دەس نەهاتن ‹لە داخان وەختە شەقە بکەم!› ☰ ١. دو نیم کردن ٢. حرص خوردن

**شەقەی قەڵماسک بیستن**: [کنایە] ترسان و تەمێ بوون ‹هێشتا شەقەی قەڵماسکی نەبیستووە، بۆیە وا دەنگی بەرزە› ☰ ترسیدن و تنبیه شدن

**لە شەقەی باڵ دان**: ١. هەڵفڕینی خێرای باڵندە ‹کەوتە خۆ دای لە شەقەی باڵ دیسا/ ئاگرێکی لە دەروون داییسا «هەژار، بۆ کوردستان»› ٢. [مەجاز] چوون و دوور کەوتنە ☰ ١. پر زدن پرنده ٢. دور شدن

**شەقە**[2]: ناوەڵناو. شەققە؛ لە سەرەوە بە نیوەیی دادڕاو ☰ از بالا به دو نیم شکافته

**شەقە**[3]: پێشوشە. بە بارستایی، ڕادە، قەبارە یان پانتایی زۆرەوە ‹شەقەجۆ؛ شەقەمشار؛ شەقەمێو ...› ☰ با حجم، مقدار یا وسعت زیاد

**شەقە**[4]: دەنگەناو. شەققە: ١. دەنگی باڵ لە فڕیندا ‹کەوی ناو قەفەز دای لە شەقەی باڵ/ دڵەکەم بۆ دڵەکەت بوو بە کۆی زووخاڵ «فولکلۆر»› ٢. دەنگی بەردەفڕکەی بە قۆچەقانی ٣. دەنگی تەقینی تەڵە و... ☰ ١. صدای بال زدن پرنده ٢. صدای فلاخن هنگام سنگپرانی ٣. صدای به هم آمدن تله و...

**شەقەباخی** / şeqebaxî/: ناو. کوولەکەسەراوی ☰ کدوحلوایی

**شەقەبەقە** / şeqebeqe/: ناوەڵناو. پارچە ـ پارچە؛ کوت‌ـکوت ☰ قطعه ـقطعه

**شەقەبەند** / şeqebend/: ناو. ١. نوشتەی سەرێشەی نیوەیی ٢. ڕەخت و ئەسپابی زین ☰ ١. دعای شقیقه ٢. یراق زین

**شەقەتنای** / şeqetnay/: چاوگ. لەقاندن؛ لەق کردن ☰ سُست کردن

**شەقەتەل** / şeqetel/: ناو. تۆپی لە پەڕۆ چندراو بۆ تۆپێن ☰ توپ پارچەای بازی

**شەقەتەلانی** / şeqetelanî/: ناو. گەمەی تۆپەڕا کردن ☰ نوعی توپ‌بازی

**شەقەتیای** / şeqetyay/: چاوگ. لەقان؛ لەق بوون ☰ سست شدن

**شەقەجۆ** / şeqeco/: ناو. شەقەجۆگە؛ شەقەجۆوە؛ جۆباری گەورە کە ئاوی هەمیشە و زۆرە ☰ جویبار

پرآب

**شەقەجۆگە / şeqecoge/:** ☜ شەقەجۆ

**شەقەجۆوە / şeqecowe/:** ☜ شەقەجۆ

**شەقەجووت / şeqecût/:** ناو. جوانەگایێ کە فێری جووت کرابێ و لەگەڵ گایەک جووتی پێ بکەن ▪ گاو جوان همشخم

**شەقەزڵلە / şeqezille/:** ☜ شەپەزلە

**شەقەزلە / şeqez(i)le/:** ☜ شەپەزلە

**شەقەزیلە / şeqezîle/:** ☜ شەپەزلە

**شەقەشەق / şeqeşeq/:** دەنگەناو. دەنگی زۆری ددان و باڵ و بەردی قۆچەقانی و ... ▪ تق و توق

**شەقەکێش / şeqekêş/:** ناو. کەسێ کە مشاری زل بە کار دێنێ ▪ ارّەکش

**شەقەگل / şeqegil/:** ناو. چاوێشەیێ کە سەری پێوە بێتە ژان ▪ چشم دردی کە سر را هم بە درد آورد

**شەقەل / şeqel/:** ☜ شەغرە

**شەقەلۆر / şeqelor/:** ناو. جۆرێ داری لێڕەوارە ▪ نوعی درخت جنگلی

**شەقەمشار / şeqem(i)şar/:** ناو. شەقە؛ هەرەی دوو کەسی ▪ ارّەی دونفره

**شەقەمێو / şeqemêw/:** ناو. کۆتەرەی ڕەز ▪ تنەی تاک

**شەقی / şeqî/:** ناوەڵناو. ١. ماندوو؛ خەستە؛ مانگ ٢. ئەشقی؛ یاخی ▪ ١. خستە ٢. سرکش

**شەقیای / şeqyay/:** چاوگ. لەقان ▪ سُست شدن

**شەقیلە / şeqîle/:** ناو. ١. چەرمی زۆر تەنک و سووک کە دەکرێتە هەمانە ٢. بەرەڵبێنەی چەرمینی ژنان لە کاتی تەشی ڕستنا ▪ ١. چرم نازک کە از آن انبان سازند ٢. پیشبند چرمین ویژەی دوک ریسی

**شەقین[1] / şeqîn/:** چاوگ. جریواندنی مەلیچک ▪ جیک جیک کردن گنجشکان

**شەقین[2]:** ناو. کێبەرکێ؛ ملە و ڕکەبەری ▪ مسابقە؛ رقابت

**شەقێن / şeqên/:** ☜ شاقۆبانێ

**شەک / şek/:** ناو. ١. شیشەک؛ بەرخی دوو بەهار دیتوو ٢. گۆچانی گۆیێن ٣. چک؛ قووڵایی زگی جک ٤. جگ کە باری لووسی بکەوێتە سەر عەرز ٥. چۆک؛ ئەژنۆ ٦. لەرەی ئاوی چەم ٧. تانجی دوو ساڵە ▪ ١. شیشک ٢. چوگان گوی بازی ٣. طرف گود شتالنگ ٤. شتالنگی کە بر کنارەی صاف ایستد ٥. زانو ٦. حرکت و لرزش آب رودخانە (امواج کوچک) ٧. تازی دو سالە

▣ **شەکی شوانانگاو:** /کینایە/ زەبوون؛ داماو؛ بەسەزوان ‹... شەکی شوانانگاو سەرقەتار بوایە/ شێری سەفشکێن کز و خوار بوایە ... «قانع»› ▪ توسری خور

**شەکی کاڵ:** بەربەران؛ شەکێ کە هێشتا بەرانی نەگرتووە ▪ گوسفند هنوز با قوچ جفت نشده

**شەکار / şekar/:** ناو. چیمەن و گیاجاڕ ▪ چمنزار

**شەکاڵ / şekal/:** ناو. شەقاڵ؛ شێرۆخ؛ کاڵک؛ کاڵە؛ کارک؛ پاتاوە؛ پاپێچ؛ پێتاو؛ خاو؛ جۆرێک پێڵاوی بە موو چندراو کە ژێرەکەی بە بەنێک دەبەسرێتە لاقەوە ▪ پالیک؛ چارغ

**شەکان[1] / şekan/:** چاوگ. لەرین بەملاولادا؛ تەکان خواردن ▪ جنبیدن

**شەکان[2]:** ناو. بازی گۆیێن ▪ گوی بازی

**شەکان[3]:** پێرۆ. ← **تەکانوشەکان**

**شەکاندن / şekandin/:** ☜ شەکاندنەوە

**شەکاندنەوە / şekand(i)newe/:** چاوگ. تێپەڕ. //شەکاندتەوە؛ دەشکێنیەوە؛ بشەکێنەوە// شەکاندن؛ شەکانن؛ ڕاژاندن؛ لەراندنەوە ▪ تکان دادن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەشەکاندنەوە

**شەکانن / şekanin/:** ☜ شەکاندنەوە

**شەکانەوە / şekanewe/:** چاوگ. تێنەپەڕ.

//شەکایەوە؛ دەشــەکێیەوە؛ بشــەکێوە// شــەکیانەوە؛ لەرینەوە (زۆرتر لە بەر با) 🇮🇷 تکان خوردن (از باد)
■ ئاوەڵناوی بەرکاری: شــەکاوەوە/ چاوگی نــەرێنی: نەشەکانەوە

**شەکاوە** / şekawe/: ئاوەڵــناو. هــەژیای؛ ڕاژاو 🇮🇷 در اهتزاز؛ جنبان

**شەکاوی** / şekawî/: ☜ شکست ـ١

**شەکبەران** / şekberan/: نــاو. شــەکی نێــری ســێ بەهارە 🇮🇷 گوسفند نر سه بهاره

**شەکر** / şek(i)r/: نــاو. شــەکەر؛ مــاکێکی بلــۆری شیرین و بێڕەنگ یان سپی کە لە نەیشەکەر یان چۆنەری قەند دروست دەکرێ و پاڵێوراوەکەی بە شێوەی دەنک ـ دەنکی شەکر یان کەڵلەی قەنــد دێتە بازاڕەوە 🇮🇷 شکر

⊡ **شەکر خواردن**: ☜ **شەکەر خواردن**

**شەکر شکاندن**: ١. شــەکری ڕەقهــەڵاتوو ورد کردن ٢. *[کینایە]* قسەی جوان کــردن ٣. *[پەلار]* قسەی قــۆڕ کــردن 🇮🇷 ١. شکر خُــرد کــردن ٢. سخن نغز گفتن ٣. یاوه گفتن

**شەکراو** / şekraw/: نــاو. شەربەتی شەکر و ئــاو بــە گوڵاو یان بیمشکەوە 🇮🇷 شکراب

⊡ **شەکراو خواردنەوە** *[کینایە]* کۆڕ گرتن بۆ ژن مارە کردن 🇮🇷 مجلس عقد گرفتن

**شەکراوی** / şekrawî/: ئاوەڵناو. ١. بە شەکرەوە تلاو ٢. پێوەندیــدار بــە خۆشــاوی شــەکرەوە 🇮🇷 ١. شکرین ٢. شکربار

**شــەکرپەنیر** / şekirpenîr/: نــاو. شــــەکەرپەنیر؛ جورێ نوقڵ لــە شــەکر و ئــارد و بەرامــەجات 🇮🇷 شکرپنیر

**شــەکرخەنە** / şekirxene/: نــاو. شــــەکرەخەنە؛ شەکەرخەن؛ بزەی جوان و بە خۆشی 🇮🇷 شکرخند

**شەکردان** / şekirdan/: نــاو. دەفری شەکر تێکــردن 🇮🇷 ظرف شکر

**شەکرشکێن**[١] / şekirşkên/: نــاو. چەکوشــی شــەکر شکاندن 🇮🇷 قندشکن

**شەکرشــکێن**[٢]: ئاوەڵــناو. شــــەکرلێو؛ قســــەخۆش؛ قسەشیرین 🇮🇷 شیرین‌سخن

**شەکرلەمە** / şekirleme/: ناو. ١. جۆرە نــانێکی زۆر ناسک و شیرینە ٢. جۆرێ برساقە، گوێز و بادام و شەکر و حلی تێ دەکەن 🇮🇷 ١. نوعی نان شــیرینی ٢. نوعی قُطاب

**شەکرلێڤ** / şekirlêv/: ☜ **شەکرلێو**

**شەکرلێو** / şekirlêw/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* شــەکرلێڤ؛ گفت و لفت خۆش؛ قسە شیرین 🇮🇷 خوش‌بیان

**شەکرمز** / şekirmiz/: نــاو. دیابێت؛ قــەن؛ شــەکرە؛ نەخۆشینێ کە تێیدا ڕێژەی شەکری خوێن بــەرز دەبێتـــەوە و زۆر بـــوونی میـــز، تینوویـــەتی و هەڵکشانی ئــوورەی خــوێنی لەگەڵــە 🇮🇷 دیابــت؛ مرض قند

**شەکرۆک** / şekrok/: ناو. شــەکەرۆکە؛ شــەکرە: ١. وشکەوەبووی شیلەی گیایەکە تــامی شــیرینە ٢. کەرتەشی؛ گیایەکی سەرخڕی دڕکاوییە خــڕێک لە بن دڕکەکانیدا هەیــە دەیخــۆن ٣. شــیرنیات؛ ئاونــەوات؛ جــۆرێ شــیرینییە بــۆ مــژین کــە بــە شەکری لە ئاوکراو و بەهارات درووس دەکرێ ٤. جۆرێ گندۆرە/ کاڵــەک 🇮🇷 ١. خشــکیدەی گیــاهی است شیرین مزه ٢. گیاهی است خاردار ٣. آب‌نبات ۴. نوعی خربُزه

**شەکرۆکە** / şekroke/: ☜ **شەکرۆك**

**شەکرە**[١] / şekre/: ناو. ١. ☜ **شەکرۆك** ٢. گــوێنی جەباری؛ گوێنیکەزەردە 🇮🇷 ١. ☜ **شــەکــرۆك** ٢. گَوَن کتیرا

**شەکرە ـ**[٢]: پێشوشە. ١. شیرن؛ شیرین ‹شەکرەســێو› ٢. هەڵکەوتە؛ سەر ‹شەکرەپیاو؛ شــەکرەژن› 🇮🇷 ١. شیرین ٢. سره؛ نیکو

**شــەکرەباوی** / şekrebawî/: نــاو. چەقەڵـــەبادامی

شیرین ﷼ چغالەی شیرین بادام

**شەکرەپیاو** / şekrep(i)yaw/: ناو. /مەجاز/ پیاوی باش و هەڵکەوتە ﷼ سرەمرد

**شەکرەخەنە** / şekrexene/: ☜ **شەکرخەنە**

**شەکرەژن** / şekrejin/: ناو. /مەجاز/ ژنی باش و هەڵکەوتە ﷼ زن شایستە

**شەکرەسێو** / şekresêw/: ناو. ١. سێف شەکەری؛ جۆرێ سێوی چکۆڵەی سپی ٢. قەندهەنگوین؛ هەر شتێکی شیرن و بە زار خۆش ﷼ ١. سیب قندی ٢. شکرپارە

**شەکری**[1] / şekrî/: ناو. ڕەنگی زەردی ئاماڵ سوور ﷼ شکری

**شەکری**[2]: ئاوەڵناو. بە ڕەنگی زەردی ئاماڵ سوورەوە ﷼ شکری

**شەکرین** / şekrîn/: ئاوەڵناو. ١. دروستکراو لە شەکر ٢. /کنایە/ زۆر شیرین و لەبەردڵ ﷼ ١. شکری ٢. شکرین

**شەکشەکان** / şekşekan/: چاوگ. شەکانەوە ﷼ جنبیدن از وزش باد

**شەکمەڕ** / şekmeř/: ناو. شەکەمەڕ؛ پەزێ کە یەکەم جار زاوە ﷼ گوسفندی کە یکبار زاییدە

**شەکنای** / şeknay/: چاوگ. شەکاندن ﷼ تکان دادن

**شەکۆ** / şeko/: ناو. ڕاساو؛ ڕم؛ داری درێژ بۆ ئاوئاژن کردن یان گوێز تەکاندن ﷼ چوب بلند برای آبیاری یا گردوچینی

**شەکۆک** / şekok/: ناو. جۆرێ هەرمێ ﷼ نوعی گلابی

**شەکو** / şekû/: ناو. ڕەوتی لەرین؛ لەرینەوە ﷼ تکان

**شەکە** / şeke/: ناو. ١. مێچکە بەرازی یەکساڵە ٢. کلاوی پێستەمەڕ ٣. ڕەوتی شەکانەوە ﷼ ١. مادە گُراز یکسالە ٢. کلاە پوستین ٣. اهتزاز

◘ **شەکە هاتن**: لەرە هاتن؛ شەکانەوە؛ تەکەتەک کردن ﷼ در اهتزاز بودن

**شەکەت** / şeket/: ئاوەڵناو. ماندوو؛ خەستە؛ شەقی ﷼ خستە

◘ **شەکەت بوون**: ماندوو بوون. هەروەها: **شەکەت کردن** ﷼ خستە بودن

**شەکەتی** / şeketî/: ناو. ماندوویەتی زۆر ﷼ خستگی زیاد

◘ **شەکەتی دەرچوون**: حەسانەوە؛ ماندوویی دەرچوون ﷼ رفع خستگی شدن

**شەکەتی دەرکردن**: وچان دان بۆ شەکەتی دەرچوون ﷼ خستگی در کردن

**شەکەتی کەسێ دەرکردن**: کارێ کردن بۆ حەسانەوەی کەسێ؛ بوونە هۆی شەکەتی دەرچوونی کەسێ ﷼ خستگی از تن کسی در کردن

**شەکەر** / şeker/: ناو. ١. ☜ **شەکر** ٢. بەشانەکەر؛ موو لەشانەدەر ﷼ ١. ☜ **شەکر** ٢. شانەزن

◘ **شەکەر خواردن**: شەکر خواردن: ١. /کنایە/ چاک گوتن؛ قسەی بەجێ و بەوەخت کردن ٢. /پلار/ بێخود کردن؛ قسەی نابەجێ گوتن ‹سەرو و نەی چین کە لەگەڵ قامەتی تۆ بێنە نەبەرد؟/ شەکەری خواردوە نەی، سەرو سەری داوە لە بەرد! «شێخ ڕەزا»› ﷼ ١. گُل گفتن ٢. غلط کردن

**شەکەرات** / şekerat/: ناو. ١. نوقڵ؛ نۆغڵ ٢. شیرنیات؛ ئاونەوات ﷼ ١. نُقل ٢. آب‌نبات

**شەکەربادام** / şekerbadam/: ناو. جۆرێ هەڵوا ﷼ نوعی حلوا

**شەکەربۆرە** / şekerbore/: ناو. جۆرێ شیرینی ﷼ نوعی شیرینی

**شەکەرپەنیر** / şekerpenîr/: ☜ **شەکرپەنیر**

**شەکەرخەن** / şekerxen/: ☜ **شەکرخەنە**

**شەکەرگری** / şekerg(i)rî/: ناو. دۆخی گریان لە

خۆشیان ☰ اشک شوق

**شەکەرلەمە** / şekerleme/: ناو. قوتتاب؛ قوتاب؛ لەبزینە ☰ قُطاب

**شەکەرۆکە** / şekeroke/: ناو. *[مەجاز]* کۆچەک؛ منالی لووسکە کە لە بەزمدا سەما دەکا ☰ بچەای کە در مجلس مهمانی می‌رقصد

**شەکەرە** / şekere/: ناو. شەکرە؛ کەرتەشی ☰ شکرتیغال

**شەکەرەک** / şekerek/: ناو. ڕوخس ☰ شکرک

**شەکەری**[1] / şekerî/: ناو. سپات؛ سپی ئامال زەرد ‹شەکەری زوو پیس دەبێ› ☰ رنگ کرم

**شەکەری**[2]: ناوەڵناو. ١. سپات؛ بە ڕەنگی سپی ئامال زەرد ‹کراسی شەکەری› ٢. شەکەردار؛ بە شەکرەوە ‹نان شەکەری› ☰ ١. کرم رنگ ٢. شکری

**شەکەزەکات** / şekezekat/: ناو. زەکاتی شەک و کاوڕ ☰ زکات گوسفند و برّه

**شەکەشەک** / şekeşek/: ناوەڵکار. تەکەتەک؛ دۆخی لەرینەوە و ویَکەوتنی شتی شۆڕەوەبوو ☰ آویخته و لرزان

**شەکەمەڕ** / şekemeř/: ☜ **شەکمەڕ**

**شەکەمێ** / şekemê/: ناو. شەکەمێنگە؛ بەرخە مێوی دوو بەهار دیتوو ☰ شیشک ماده

**شەکەمێنگە** / şekemênge/: ☜ **شەکەمێ**

**شەکەن** / şeken/: ناو. تۆبە؛ پەتە ☰ توبه

**شەکەنە** / şekene/: ناو. ڕەوتی شەکان؛ بزوان ☰ لرزش

**شەکەنێر** / şekenêr/: ناو. بەرخی نێری دوو بەهاردیتوو ☰ شیشک نر

**شەکی**[1] / şekî/: ناو. دارێکی جەنگەڵییە بەرێکی وەک فندق دەگرێ ☰ درختی جنگلی

**شەکی**[2]: ناوەڵناو. *[پلار]* شرەبار؛ کەرپاڵ؛ شرۆڵ؛ بە جلوبەرگی کۆن و دڕاوەوە ☰ ژنده‌پوش

**شەکیانەوە** / şekyanewe/: ☜ **شەکانەوە**

**شەکیلە** / şekîle/: ناو. پارچە هەمانەی خۆشکراو بۆ بە سەر دەفر داگرتن ☰ قطعه انبان دهانه‌بند ظرف

**شەکیلی** / şekîlî/: ناو. پینەچی؛ پینەدۆز؛ مشەقە ☰ پینه‌دوز

**شەکێرت** / şekêrit/: ناو. باوانی؛ پێتەک؛ جیازێ کە بووک لەگەڵ خۆیا دەیبا بۆ ماڵ زاوا ☰ جهیزیّه

**شەکێن** / şekên/: ☜ **شاقۆبانێ**

**شەگ** / şeg/: ناو. ١. شەق؛ گۆچانی شەقێن ٢. گۆی شەقێن ☰ ١. چوگان چوگانبازی ٢. گوی چوگانبازی

**شەگگە**[1] / şegge/: ناو. تەف؛ نەکس؛ باری میری قاپ ☰ طرف گود شتالنگ

**شەگگە**[2]: سارستە. سلاو؛ سەلام ☰ سلام

**شەگورگانە** / şegurgane/: ناو. پیرۆشک؛ خلێرە؛ کەرەکەوڵە ☰ خرخاکی

**شەگە**[1] / şege/: ناو. ١. میچ کە میر هاتبێ؛ جگ لە سەر لا پانەکەی ٢. تاژی لە خرتکچوو ☰ ١. شتالنگ که بر کناره‌ی صاف ایستد ٢. تازی مفصل دررفته

**شەگە**[2]: دۆعا. شاگا؛ شاگە؛ شاد؛ بژی ☰ درود

**شەگەل** / şegel/: ناو. گەلەشەک؛ مێگەلێ کە هەمووی شەک بێ ☰ رمه‌ی شیشک

**شەگێن** / şegên/: ناو. ١. ☜ **شاقۆبانێ** ٢. جۆرێ گەمەی جگێن ☰ ١. ☜ **شاقۆبانێ** ٢. نوعی بازی با شتالنگ

**شەل**[1] / şel/: ناو. ١. بەڕە و مافوورەی خواروخێچ ٢. خەرار؛ جواڵی موویین ٣. چێنکە؛ پەڵە و سەوزایی لە ناو پووش و پاری وشکدا ٤. ڕانک ٥. لەت؛ پاژ ☰ ١. فرش کج ٢. جوال موبین ٣. سبزه و چمنی که اطرافش خشک باشد ٤. شلوار پشمی ٥. قسمت؛ تکه

**شەل**[٢]: ئاوەڵناو. ١. لـە پـا سـەقەت ٢. ڕووت؛ بـێ جلوبەرگ ⊠ ١. لَنگ؛ شَل ٢. لُخت

**شەلاتان** / şelatan/: ☜ **شەلاتی**

**شەلاتی** / şelatî/: ئاوەڵناو. شـەللاتی؛ شـەلاتان؛ قولتەشە ⊠ شارلاتان

**شەلاخ** / şelax/: ناو. ١. تازیانـە؛ قـامچی ٢. زللە؛ زیللە ⊠ ١. شلاق ٢. سیلی

**شەلاخکاری** / şelaxkarî/: ناو. کاری بە قامچی لـێ دان ⊠ عمل شلاق زدن

**شەلاف** / şelaf/: نـاو. کلکەسـووتە؛ مـەرایی ⊠ چاپلوسی

⊡ **شەلاف کرن**: شالووزی کرن؛ مـەرایی کـردن ⊠ چاپلوسی کردن

**شەلاق** / şelaq/: نـاو. ١. قـامچی؛ شـەلاخ ٢. کەرخول؛ جۆرێ مـەزرەقی بـێ تمتمـە کـە بـە قامچی بەن، دەیسـووڕێنن ⊠ ١. شـلاق ٢. نـوعی گردنا

**شەلاقە** / şelaqe/: نـاو. شـێلاقە؛ شـێللاقە: ١. شەلاق؛ جۆرێ مـەزرەقی بـێتمتمـە ٢. تۆرەمـە بالندەیەکی تەنکاوانە، کۆچـەرن، بالـیان درێـژ و سـەر پـەڕ تیـژن، چـەن جۆریـان هەیـە: ئەحمەدڕاوکـەر، شـێلاقەبۆرە؛ شێلاقەشـامی، شێلاقەشـەنگە، شێلاقەعەسڵـە، شـێلاقەبچووک؛ شێلاقە بەر زگ ڕەش، شێلاقە خاڵخاڵ و... ⊠ ١. نوعی گردنا ٢. آبچلیک

**شەلال**[١] / şelal/: نـاو. ١. شـەلال؛ شـەلال؛ ڕیزەدروومانـێ کـە دەزوو لـە هـەر دوو دیـوی پارچەکەوە دەردێ ٢. سلار؛ کاری درێژ بوون لـە سەر زەوی ٣. تاڤگە؛ ئاوهەڵـدێر؛ سـوولاڤ ⊠ ١. دوخت شـلال ٢. عمـل دراز کشـیدن روی زمـین ٣. آبشار

**شەلال**[٢]: ئاوەڵناو. ١. نەرم و ناسک ٢. خـەمڕەوێـن ⊠ ١. نرم و نازک ٢. شادی‌آور

**شەلان**[١] / şelan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //شەلای؛ دەشەلێی؛ بشەلێ// ١. شەلیان؛ ڕووت بوونەوە؛ جـل لـە بـەر خۆ داکەنـدن ٢. شـەلین؛ شـەلیان ٣. چـەقین؛ چەقان؛ چەقیان؛ تێرۆ چوون ⊠ ١. لُخت شـدن ٢. لنگیدن ٣. فرورفتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەشەلان

**شەلان**[٢]: ناو. جۆرێ هەڵپەڕکێ ⊠ نوعی رقص

**شەلاندن** / şelandin/: چاوگ. ١. شەلیاندن؛ ڕووت کردن؛ ڕووت کردنەوە ٢. چەقاندن؛ چەقانن؛ تێرۆ کردن ⊠ ١. لُخت کردن؛ لباس از تن کسی درآوردن ٢. فرو کردن

**شەلانە**[١] / şelane/: ئاوەڵناو. وەک شەلان ‹ڕۆیـینی شەلانە› ⊠ لنگ مانند

**شەلانە**[٢]: ئاوەڵکار. لەنگەلەنگ؛ شەلەشەل ‹شـەلانە دەڕۆیشت› ⊠ لنگان

**شەلای** / şelay/: ☜ **شەلین ـ٢**

**شەلایی** / şelayî/: نـاو. دەسـرەی سـرکەیی ⊠ دستمال سرکه‌ای

**شەلبت** / şelbit/: ئاوەڵناو. پـرووش؛ کـەمبینـا و نەخۆش (چاو) ⊠ کم‌سو (چشم)

**شەلبتی** / şelb(i)tî/: نـاو. چـاوێ کـە تووشـی پرووشی بووبێ ⊠ چشم دچار کم بینی و درد

**شەلپتاندن** / şelp(i)tandin/: چـاوگ. ١. لـە ڕیشەوە دەرهێنان؛ لە بنەوە هەڵـکەندن ٢. دوور کردنەوە ⊠ ١. از ریشه کندن ٢. دور کردن

**شەلپین** / şelpîn/: چاوگ. ١. لە ڕیشەوە دەرهاتن؛ لە بنـەوە هەڵـکەنران ٢. دوور کەوتنـەوە ⊠ ١. از ریشه کنده شدن ٢. دور شدن

**شەلپینی** / şelpînî/: نـاو. *[کینایە]* ئـاوارەیی؛ دەربەدەری ⊠ آوارگی

**شەلت** / şelt/: ناو. داری درێژ و باریک ⊠ چوب بُلند و باریک

**شەلتە** / şelte/: ناو. شـەختە؛ سـەرمای سـەختی

پاییز ☰ سرمای سخت و نابهنگام پاییز

**شەلف** / şelf/: ناو. ١. ساتمە؛ ڕەت ٢. /کینایە/ ژنی خۆفرۆش ☰ ١. سکندری ٢. زن خودفروش

**شەلفە** / şelfe/: ناو. عاج؛ خیل؛ ئاج ☰ عاج

**شەلفین** / şelfîn/: چاوگ. ڕەت بردن و کەفتن ☰ سکندری خوردن و افتادن

**شەلق**[1] / şelq/: ناو. ١. ڕیپۆقی چاو ٢. زینچکاوی برین ٣. تای هەموو ڕۆژە ٤. چێوشەقە؛ داری بنباڵی پاسەقەت ٥. کرۆسک؛ جۆرێ هەرمێ کێوی ☰ ١. ژَفَک ٢. چرک و ریم زخم ٣. تب روزانه ۴. چوب زیربغل ۵. نوعی گلابی وحشی

**شەلق**[2]: ئاوەڵناو. لاڕزیوی سیس‌بوو (میوە و سەوزی) ☰ پلاسیده (میوه و سبزی)

**شەلقاندن** / şelqandin/: چاوگ. ١. ڕاهێنانی ئەسپ بۆ خۆشڕۆیی ٢. زووڕانەوەی ناوڕان، لە بەر زۆر ڕۆیشتن ٣. /کینایە/ لە کۆڵ خۆ کردنەوە ☰ ١. تعلیم دادن اسب ٢. احساس درد و سوزش کردن در کشالەی ران، از فرط خستگی ٣. دک کردن

**شەلقین** / şelqîn/: چاوگ. ڕزان و گنخان (میوە و سەوزی و هێلکە) ☰ پوسیدن و فاسد شدن (میوه و سبزی و تخم مُرغ)

**شەلک** / şelk/: ناو. چارۆکەی شان و سەر ☰ چارقد

**شەلکە** / şelke/: ناو. نەخۆشییەکی سمی ئاژەڵە ☰ نوعی بیماری سُم دام

**شەللاتی** / şellatî/: ☜ **شەلاتی**

**شەللاق** / şellaq/: ناو. تازیانە؛ قامچی؛ شەلاخ؛ جەلدە ☰ تازیانه

**شەلم** / şelim/: ☜ **شەڵغەم**

**شەلمکوێرم** / şelimk(i)wêrim/: ئاوەڵکار. /کینایە/ کاری لێدانی بێ بیرکردنەوە و ئامانجێکی تایبەت ‹شەلمکوێرم کەوتە نێویان، چەن کەسی بریندار کرد!› ☰ انجام ضرب و شتم، بدون ملاحظه و هدف مُشخص

**شەلمکە** / şelimke/: ناو. سەڵمکە؛ گیایەکە ☰ گیاهی خوردنی

**شەلمە** / şelme/: ناو. گیایەکە لە ناو گەنم دەڕوێ و دەنکەکەی تێکەڵی گەنم دەبێ ☰ گیاهی که در گندمزار می‌روید

**شەلوار** / şelwar/: ☜ **شەڵوار**

**شەلوپەت** / şel û pet/: ئاوەڵناو. لەتوپەت؛ تەواو دڕاو ☰ لت‌وپار

**شەلوشێت** / şel û şêt/: ئاوەڵناو. گێژ و حۆل ☰ گیج و منگ

**شەلوف**[1] / şeluf/: ناو. کەڵەشێری خڕکەڵەی چکۆلە ☰ خروس ریزاندام

**شەلوف**[2]: ئاوەڵناو. بیژە؛ بیچ؛ پیچ؛ زۆڵ ☰ حرامزاده

**شەلوکوت** / şel û kut/: ☜ **شلوکوت**

**شەلو** / şelo/: ☜ **شیلەوگەرم**

**شەلوک** / şelûk/: ناو. شەلوومک؛ داروو‌کەیەک کە دەمووکانەی تێ هەڵدەسوون بۆ ڕاوەمەل ☰ چوبک دبق‌آلود که پرنده را با آن شکار می‌کنند

**شەلومک** / şelûmik/: ☜ **شەلوک**

**شەلە**[1] / şele/: ناو. ١. ☜ **شەلەگە** ٢. یەکێ لە ئەستێرەکانی حەوبراله ☰ ١. ☜ **شەلەگە** ٢. یکی از ستاره‌های بنات‌النعش

**شەلە**[2]: ئاوەڵناو. شەل؛ پاسەقەت ☰ لنگ؛ شل

**شەلەشەل** / şeleşel/: ئاوەڵکار. حاڵەتی ڕۆیشتن بە پای سەقەت ☰ لنگان ـ لنگان

**شەلەگە** / şelege/: ناو. شەلە؛ شەلیە؛ شێلەگە؛ جێگەی دادڕینی جۆگە ☰ برغ؛ برغاب

**شەلەگەڤری** / şelegev(i)rî/: ناو. گیایەکی شیرداره ☰ گیاهی است

**شەلەل** / şelel/: ناو. ئیفلیجی؛ نەخۆشی فەلەج ☰ فلج

**شەلەم** / şelem/: ناو. ١. ☜ **شەڵغەم** ٢. ☜ **شەلەمین**

**شەلەمشــــۆربا / şelemşorba**/: نـــــاو. [کینایــــه] شەلەمشۆروا؛ کاری نارێک و تێکەڵ ــ پێکـەڵ ☰ کارِ درهم‌برهم

**شەلەمشۆروا / şelemşorwa**/: ☜ **شەلەمشۆربا**

**شەلەمکەرە / şelemkere**/: نـاو. شـەلەمین کـەرە؛ پشیپاییزە؛ پشیلەپایزە ☰ قاصدک

**شەلەمە / şeleme**/: ناو. ١. گیایەکـە بنەکـەی لـە پەتاتە دەکا و زۆر ڕەوانە ٢. سەرپۆشێکی ژنانە ☰ ١. گیاهی مسهل، شبیه سیب‌زمینی ٢. سرپوشی زنانه

**شەلەمەباخی / şelemebaxî**/: نـاو. تۆپڵەگیا ☰ کلم صحرایی

**شەلەمین / şelemîn**/: ناو. شەلەم؛ شیمی؛ چێشتی ترخێنە ☰ نوعی آش محلی

**شــەلــەمینخۆشــکەرە / şelemînxoşkere**/: نـــاو. باویلکە؛ بایلکە؛ باوێلێ؛ باوەلێ ☰ قاصدک

**شەلەمینکەرە / şelemînkere**/: ☜ **شەلەمکەرە**

**شــەلەنگ / şeleng**/: ئاوەڵـــناو. بەلەنجـــــەولار؛ قەدباریک و پێکەوتوو ☰ خرامان

**شەلەنگی / şelengî**/: ناو. لەنجەولار ☰ خرام

**شەلی**[1] / **şelî**/: ناو. ١. سپیندار؛ سـپیدار؛ شـۆخ ٢. دۆخی شەل بوون ☰ ١. سپیدار ٢. لنگی

**شەلی**[2]: ئاوەڵـناو. ڕووتـەوەکراو: ١. جلـک لـە بـەر داماڵدراو ٢. [کینایە] تـالانکراو ☰ ١. لُخـت‌شـدە از لباس ٢. غارت‌شده

**شەلیان / şelyan**/: ☜ **شەلین ــ٢**

**شەلیاندن / şelyandin**/: ☜ **شەلاندن ــ١**

**شەلیای**[1] / **şelyay**/: ناو. شەلی؛ پاسەقەتی ☰ لنگی

**شەلیای**[2]: ئاوەڵناو. ١. ڕووتەوەکراو بە دەستی چەتە ٢. جل لە بـەر خـۆ داکەنـدوو ☰ ١. غـارت شـدە توسط راهزنان ٢. لباس از تن درآورده

**شەلیپان / şelîpan**/: ناو. مۆزەشینە ☰ نوعی زنبور

**شەلیت / şelît**/: نـاو. شــریت؛ هــەودای بـادراو ☰ رشته‌ی تابیده

**شەلیتە / şelîte**/: ناو. شەتە؛ جۆرێک دامەنی کول، دەڵپ و پرچین کە ژنان لە سەر دەرپێ لـە پێـی دەکەن ☰ دامن شلیته

**شەلیک / şelîk**/: نـاو. شـلیک؛ تـووی زەوینــە ☰ توت‌زمینی

**شــەلیل / şelîl**/: نـــاو. شـــــلۆر؛ حەمیشـــــــن؛ حەمەدەشین؛ تەڕازەن؛ تەرەزەن: ١. دارێـک لـە تیرە و جۆری قۆخ و هەشتاڵوو ٢. بەری ئـەو دارە کە گۆشتن و لووسە ☰ ١و٢. شلیل

**شەلین / şelîn**/: چاوگ. تێنەپەر. //شەلیت؛ دەشـەلی؛ بشەلە// ١. ڕووت بوونەوە لە جلـک و شمـەک ٢. شەلان؛ شەلای؛ شەل ڕۆیشتن ☰ ١. لُخت شـدن ٢. لنگیدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: شــەلیو/ چـاوگی نـەرێنی: نەشەلین

**شەلیە / şelye**/: ☜ **شەلەگە**

**شەلیەتی / şelyetî**/: ناو. کولەکی؛ شەلی ☰ لنگی

**شەلا / şela**/: ☜ **شەلّلا**

**شەلاڵ**[1] / **şelał**/: ☜ **شەلال**[1]**ــ١**

**شەلاڵ**[2]: ئاوەڵـناو. شــەتڵ؛ شەڵـتان؛ تێـوەدراو ☰ آغشته

**شەلاڵە / şelałe**/: ☜ **شەلال**[1]**ــ١**

**شەلاڵی / şelałî**/: ناو. تێوەدراوی ☰ آغشتگی

**شەلانە / şelane**/: ☜ **شلانە**

**شەلانی / şelanî**/: ☜ **شلانە**

**شەڵبتـی**[1] / **şełb(i)tî**/: نـاو. ڕەوتی هەڵـەنگووتن و کەوتن ☰ عمل سکندری خوردن و افتادن

**شەڵبتی**[2]: دەنگەناو. دەنگی بە دەست یان بە سەوڵ لە ئاو دان ☰ صدای با دست یا با پارو زدن به آب

**شەڵتان / şełtan**/: ئاوەڵناو. خەپەخان؛ خەڵـتان ☰ آغشته

**شەڵتوک / şełtûk**/: ☜ **چەڵتوک**

**شەڵتە / şełte**/: ناو. ١. دەرمانێکی خەستە لە سەر

برینی دادەنێن ٢. ڕەشکەی کاکێشان ٣. جۆرێ ئاواڵ‌کراسی ژنانە ٤. بەرگی دۆشەک و باڵشت ٥. شەختە؛ سەرما و سۆڵەی ناوەختی پاییز. هەروەها: **شەڵتە بردن** ٦. شڵخەمێش؛ بەرەی تازەی مێشەنگوین ٧. زوقم ٨. ژێرکراسێکی ژنانەیە بۆ وەختی خەو ☰ ١. داروی غلیظ کە بر روی زخم می‌گذارند ٢. تور کاهکشی ٣. نوعی شلوار زنانە ۴. روتختی و روبالشی ۵. سرمای زودرس پاییزی ۶. نسل جدید زنبور عسل ۷. پژ؛ سرماریزە ۸ نوعی لباس خواب زنانە

**شەڵخە / şełxe/**: ☜ **شەڵغە**

**شەڵغە / şełğe/**: ناو. شڵخە؛ شەڵخە؛ شڵغە؛ پوورەی مێرووی وەک مێش و مێشەنگوین ‹مێش و مێشوولە شەڵغەیان دابوو/ ڕێ نەما بۆ هەناسە هەڵکێشان «حەقیقی»› ☰ نسل تازەی حشرات مانند مگس و زنبور

**شەڵغەم / şełğem/**: ناو. ناو. شەلم؛ شەلەم؛ شیمی؛ شێلم: ١. گیاییەکی ئالیکی یەک یان دووساڵانە لە تیرەی سڵق و چۆنەر کە وەک سەوزی دەچێندرێ ٢. بنی ئەستوور و گۆشتنی ئەو گیایە کە ئەستوور و گوشتنە، چێژەی توندە و دەخورێ ☰ ١و٢. شلغم

**شەڵڵا / şełła/**: سارستە. شەڵا؛ بریا؛ خۆزگا؛ خۆزیا ‹شەڵلا هەر نەمدیبایا/ شەڵلا نەمناسیبایا «گۆرانی»› ☰ ای کاش

**شەڵوار / şełwar/**: ناو. شەلوار: ١. جۆرێ دەرپێی بە گنجی ژنانە ٢. پاتۆڵی پیاوانە ☰ ١. شلوار چیندار زنانە ٢. شلوار مردانە

**شەڵەخە / şełexe/**: ناو. کولوورە؛ پلوورە؛ پوورە ☰ نسل جدید زنبورعسل

**شەڵیتە / şełîte/**: ئاوەڵناو. بێ‌شەرم؛ سەلیتە ☰ سلیطە

**شەم / şem/**: ناو. ١. شەمع؛ مۆم؛ مێو؛ مۆمی؛ بالمەمی؛ شەمالک؛ شەمالک؛ شەمانک؛ شەمال؛ شەماڵ؛ شما؛ بەلمیت؛ فند؛ قرجەنە؛ تیکەیەک لە مۆم یان چەوری کە پلیتەیەکی بۆ ڕووناکی تێ خراوە ٢. فەند؛ شەمع؛ شەمی ماشین ٣. شەمع؛ شەمعەک؛ پالەوانە؛ فێلپایە؛ بالین؛ شێرگورگە؛ کۆلەکەیەکی چێوی یان کانزایی بۆ بەرگری لە دارمانی ماڵ (میچ یان دیوار) کە لە ژێر و پاڵیدا دادەنرێت ٤. شەمع؛ یەکەی ڕادەی ڕۆشنایی ٥. *[مەجاز]* شەمع؛ ئەوەی هۆی ڕووناکییە ‹ئەو شەمی کۆڕی مە بوو› ٦. بەرسێبەر ٧. ☜ **شەمۆ** ☰ ١تا۵. شمع ۶. جای سایە ۷. ☜ **شەمۆ**

**شەما[1] / şema/**: ناو. ڕەشنووس؛ پێش‌نووس ☰ پیش‌نویس

**شەما[2]**: ئاوەڵناو. توندنووس؛ زوونوس ☰ تندنویس

**شەماتۆک / şematok/**: ناو. زەوینی خلیسکانێ ☰ زمین مخصوص سُرسُرەبازی و اسکی

**شەماتە / şemate/**: ناو. ١. کۆمەڵگا؛ خەڵک و ئاوایی ٢. چەقەوهەرا؛ زەنازەنا؛ قیرەقیر ☰ ١. اجتماع ٢. جار و جنجال

**شەمار / şemar/**: ناو. ١. خزۆک؛ مارموور؛ هەر یەکە لە گیانەوەرانی ڕیزی خزۆکان ٢. ☜ **شەهمار** ☰ ١. خزندە ٢. ☜ **شەهمار**

**شەمارە / şemare/**: ناو. ڕەوتی خزین ☰ خزیدن

**شەمارەنگ / şemařeng/**: ناو. بۆیاخی قۆندەرە؛ بۆیەی کەوشان ☰ واکس

**شەماق / şemaq/**: ☜ **شەپەزلە**

**شەماڵ / şemal/**: ناو. ١. شەمالک؛ شەماڵ؛ شەمالک؛ مۆمی داگرساندن ٢. تیشکی چرا و مۆم ☰ ١. شمع ٢. روشنایی چراغ و شمع

**شەمالک / şemalik/**: ☜ **شەماڵ-١**

**شەماڵە / şemale/**: ناو. شەمالێ؛ شەمۆلە؛ شەمێلە؛ شەوشەمەکێ؛ کاری گوێ گرتنی پەنامەکی ژنان بە شەو لە قسەی خەڵک بۆ بەختی خۆ تاقی

کردنەوە ☰ فالگوش شبانەی زنان برای براورد بخت خویش

**شەمالێ / şemalê/:** ☜ **شەماڵە**

**شەماڵ / şemał/:** ناو. ١. ☜ **شەماڵ ـ١** ٢. بای فێنکێ کە لای باکوورەوە دێ ‹یادم نمەشی جە گـردین حالـدا/ چەنی بال تەیر یا وە شەمالدا «مەولەوی»› ☰ ١. ☜ **شەمال ـ١** ٢. باد شُمال

**شەماڵپا / şemałpa/:** ناوەڵناو. /مەجاز/ خۆشـبەز؛ خۆشرۆ ☰ بادپا

**شەماڵک / şemałik/:** ☜ **شەمال ـ١**

**شەماڵگیر / şemałgîr/:** ناو. قاقڵی بەهار ☰ گُلپر

**شەمام / şemam/:** ☜ **شەمامە**

**شەمامۆک / şemamok/:** ☜ **شەمامە**

**شەمامۆکە / şemamoke/:** ☜ **شەمامە**

**شەمامە / şemame/:** ناو. شمام؛ شمامۆک؛ شەمام؛ شەمامۆک؛ شەمامۆکە؛ شەموومە؛ بنچک و بەری گیایەک لە تیرەی خەیار، بە بۆنێکی خۆشەوە ☰ دستنبو

**شەمان / şeman/:** ☜ **شەمدان**

**شەمانک / şemanik/:** ناو. شەم؛ مۆم ☰ شمع

**شەمانی / şemanî/:** ☜ **شەمدانی**

**شـەمبلیلک / şemb(i)lîlik/:** نـاو. شـەمبەلیک؛ شەمبەلیلە؛ شەمبەلیلک؛ شەمبەلوولک؛ شملـی؛ شملیە؛ شەملیە؛ حەوینج؛ گیایەکی شین لە بیچمی وێنجە بە گوڵی سپی یان زەرد و تامێکی توندەوە ☰ شنبلیله

**شەمبۆ / şembo/:** ☜ **شەمۆ**

**شەمبۆز / şemboz/:** ☜ **شەمبوز**

**شەمبو / şembû/:** ☜ **شەمۆ**

**شـەمبوز / şembûz/:** ناوەڵناو. شـەمبۆز؛ شمـووز؛ شەعمووز؛ شەمووز؛ شەمووس؛ چەمووش؛ سـڵ؛ ڕەوەک؛ ڕامنەبوو؛ جۆتەهاوێژ و گازگر. هـەروەها: **شەمبووزی** ☰ چموش

**شەمبە / şembe/:** ☜ **شەمۆ**

**شـەمبەلوت / şembelût/:** نـاو. شـابەڕوو؛ بەڕووەخاسە؛ کەستانە ☰ شاه‌بلوط

**شـەمبەلولک / şembelûlik/:** نـاو. ١. گیایەکـە ٢. ☜ **شـەمبـەلیلـک** ☰ ١. گیـاهی اسـت ٢. ☜ **شەمبەلیك**

**شەمبەلیک / şembelîk/:** ☜ **شەمبلیلك**

**شەمبەلیلک / şembelîlik/:** ☜ **شەمبلیلك**

**شەمبەلیلە / şembelîle/:** ☜ **شەمبلیلك**

**شەمبی / şembî/:** ☜ **شەمۆ**

**شەمت / şemt/:** ناو. خلیسک؛ جێگای لووس و لیـژ ☰ لیزگاه

**شـەمتاندن / şemtandin/:** چـاوگ. خلیسـکاندن؛ خزاندن ☰ لیز دادن

**شەمتر / şemtir/:** ناوەڵناو. سـەربەخۆ و نەزانانـە ☰ ناآگاهانه

**شەمتۆک / şemtok/:** ناو. ١. یاریکەری خلیسـکێنە ٢. زەویـنـی خلیسـکێن ☰ ١. اسکی‌باز ٢. زمـین اسکی

**شـەمتی / şemtî/:** ناوەڵـناو. خلیسـکاو؛ خزیـاگ ☰ لیزخورده

**شەمتین / şemtîn/:** چاوگ. خلیسـکان؛ خزیـان ☰ لیز خوردن

**شەمچک / şemçik/:** ناوەڵـناو. گزیکـار؛ حیلەسـاز؛ تەڵەکەباز ☰ حیله‌گر

**شەمچە / şemçe/:** نـاو. شـخاتە؛ شـخارتە؛ شـغاتە؛ شـغارتە؛ شـقارتە؛ شقاڵـتە؛ شـەمزین: ١. چیلکەیەک کـە سـەرێکی گـۆگردی پێوەیـە بـۆ داییساندنی ئاور ٢. قـوتیلکی چێ‌کـراو بـۆ ئـەو چیلکە ☰ ١. چوب کبریت ٢. قوطی کبریت

**شەمچێکەر / şemçêker/:** ناو. مۆمکەر ☰ شمع‌ساز

**شەمخالتک / şemxaltik/:** ناو. چەسپێکە لە جۆری گیا دەگیرێ ☰ نوعی چسب گیاهی

**شەمخین / şemxîn/:** چاوگ. ترش بوون لە بەر گەرما 🇮🇷 ترشیدن از گرما

**شەمدان / şemdan/:** ناو. شەمان؛ شەمدوو؛ شەمسۆز؛ شەمعدان؛ جێگەی مۆم 🇮🇷 شمعدان

**شەمدانی / şemdanî/:** ناو. شەمانی؛ گوڵەشەمالی؛ گوڵەشەمالیە؛ گوڵێکە بە زۆر ڕەنگەوە: سپی، سووری ئامال پرتەقالی، چێرەیی و... 🇮🇷 گُل شمعدانی

**شەمدو / şemdû/:** ☜ شەمدان

**شەمراندن / şemrandin/:** چاوگ. ١. بڕینەوە ‹ساقی شەمراند قەخوار دوردی/ مانەندی دەری لسانێ کوردی «خانی»› ٢. جیا بوونەوە؛ پشت تێ کردن 🇮🇷 ١. خاتمه دادن ٢. ترک کردن

**شەمرین / şemrîn/:** چاوگ. بڕانەوە 🇮🇷 خاتمه یافتن

**شەمڕ / şemř/:** ناو. کاری تووڕ دان؛ پەرت کردن 🇮🇷 پرتاب

**شەمڕاندن / şemřandin/:** چاوگ. تووڕ دان؛ دوور هاویشتن 🇮🇷 پرتاب کردن

**شەمز / şemz/:** ناو. شەمس؛ ژاکاوی؛ سیسی 🇮🇷 پژمُردگی

**شەمزان / şemzan/:** چاوگ. تێنەپەڕ. //شەمزای؛ دەشەمزێی؛ بشەمزێ// شەمزین؛ شەمسان؛ شەمسین: ١. ژاکان ‹پاییز هات و گوڵ و گەڵا شەمزا› ٢. ڕەنگ پەڕین ٣. پەشۆکان 🇮🇷 ١. پژمُردن ٢. رنگ باختن ٣. آشفته شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: شەمزاو/ چاوگی نەرێنی: نەشەمزان

**شەمزاندن / şemzandin/:** چاوگ. تێپەڕ. //شەمزاندت؛ دەشەمزێنی؛ بشەمزێنە// ژاکاندن 🇮🇷 پژمُرده کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەشەمزاندن

**شەمزاو / şemzaw/:** ئاوەڵناو. شەمزیو: ١. ژاکاو؛ سیس‌بوو ٢. ڕەنگ‌پەڕیو ٣. پەشۆکاو 🇮🇷 ١. پژمُرده ٢. رنگ‌باخته ٣. آشفته

**شەمزە / şemze/:** ئاوەڵناو. ساوا (ئاژەڵ) ؛ تازەزاو (کارژیلە و بەرخۆلە) 🇮🇷 نوزاد (برّه و بُزغاله)

**شەمزی / şemzî/:** ئاوەڵناو. ژاکاو؛ سیس‌بوو 🇮🇷 پژمُرده

**شەمزین[1] / şemzîn/:** ☜ شەمزان

**شەمزین[2]:** ☜ شەمچە

**شەمزیو / şemzîw/:** ☜ شەمزاو

**شەمس / şems/:** ☜ شەمز

**شەمسان / şemsan/:** ☜ شەمزان

**شەمسۆز / şemsoz/:** ☜ شەمدان

**شەمسین / şemsîn/:** ☜ شەمزان

**شەمشا / şemşa/:** ☜ شمشاد

**شەمشە / şemşe/:** ☜ شەمشەمەکوێرە

**شەمشەڵە / şemşełe/:** ☜ شەمشەمەکوێرە

**شەمشەمۆتک / şemşemotik/:** ناو. جۆرێ مارمێلکە 🇮🇷 نوعی مارمولک

**شەمشەمە / şemşeme/:** ☜ شەمشەمەکوێرە

**شەمشەمەکوێرە / şemşemek(i)wêre/:** ناو. شەفرەفیک؛ شەفرەفین؛ شەفرەوین؛ شەفرەفک؛ شەفڕەفین؛ شەفڕەفینک؛ شەفڕەفیک؛ شەفشەفۆک؛ شەفکۆر؛ شەمشە؛ شەمشەمە؛ شەمشەڵە؛ شەمەلە؛ شەمەلەکۆرە؛ شەمەڵەکۆرە؛ شەوکۆرە؛ چەکچەکیلە؛ چەکچەکی؛ گوهاندارێکی شەوفڕە، زستان‌خەو و بەچکەزێیە، بە گەل لە سەر لق‌وپۆی داران، لە گازی زناران یا دە کونی ئەشکەوتان دەژین، بڕێکیان میوەخۆر و هەندێکیان مێروو خۆرن 🇮🇷 خُفاش؛ شب‌پره

**شەمشیربال / şemşîrbał/:** ناو. چەوروو‌کە 🇮🇷 بادخورک

**شەمشێر / şemşêr/:** ☜ شیر-٢

**شەمشێرکرۆژ / şemşêrk(i)roj/:** ئاوەڵناو. [مەجاز] ئازا لە شەڕ 🇮🇷 جنگجوی شُجاع

**شەمشێرە** / şemşêre/: ناو. قەلقوولـە؛ ئاچـەری دارینی درگا لە پشـتەوە داخسـتن ☰ کلیـد قُفـل چوبین

**شەمع** / şem'/: ☜ شەم ـ١تا٥

**شەمعدان** / şem'dan/: ☜ شەمدان

**شەمعەک** / şem'ek/: ناو. ١. مۆمک؛ کەرەسـەیەک لە برێ دەزگـای گـەرمادەر (وەک: سـۆپا، کـوورە، ئاوگەرمکەر و ...)دا کە بۆ هەڵکردنی مەشخەڵـی سەرەکی، بە گڕێکی لاوازەوە دەگڕێ ٢. پاڵەوانە؛ شەم؛ تیرێکی حوماڵ لە پاڵ یان ژێـری دیـواردا، بۆ بەرگری لە داڕمانی ماڵ ☰ ١و٢. شمعک

**شەمکۆر** / şemkor/: ناو. شـووکا؛ جۆرێـک ئاسـکی یەک ساڵە وێنەی بزنەکێوی ☰ شوکا

**شەمل** / şeml/: ناو. جاجم یان هەر کرێـک کـە دە خۆیەوە دەپێچن ☰ هرچە خود را در آن پیچند

**شەملک** / şemilk/: نـاو. ١. دوگرد؛ بەرماڵ ٢. فۆتە؛ شتێ کە خوار کەمـەر دادەپۆشـێ ☰ ١. سـجادە؛ جانماز ٢. لُنگ

**شەملیە** / şemiłye/: ☜ شەمبلیلك

**شەممۆ** / şemmo/: نـاو. شـەم؛ شـەمبۆ؛ شـەمبوو؛ شەمبە؛ شەمبێ؛ شەمۆ؛ شەممە؛ شەمە ☰ شنبە

**شەممە** / şemme/: ☜ شەممۆ

**شەمۆ** / şemo/: ☜ شەممۆ

**شەمۆلکە** / şemolke/: ↓

⊡ **شـەمۆلکە داگـرتن:** مـــووش کـــردن؛ پـــێش خواردنەوە ☰ خودخوری کردن

**شەمۆلۆوە** / şemolowe/: ☜ شەمێلە ـ١

**شەمۆلە** / şemole/: ☜ شەمالە

**شەموت** / şemût/: ↓

⊡ **شەموت دان:** دەورە دان ☰ دور گرفتن

**شەموز** / şemûz/: ☜ شەمبوز

**شەموزی** / şemûzî/: ناو. سرتی؛ سرکی؛ تۆسنی ☰ چموشی

**شەموس** / şemûs/: ☜ شەمبوز

**شەمولە** / şemûle/: ناو. چرافتیلە؛ قودیک ☰ چراغ موشی

**شەمومە** / şemûme/: ☜ شەمامە

**شەمە** / şeme/: ☜ شەممۆ

**شەمەتریکە** / şemet(i)rîke/: ☜ شەمەترێلکە

**شەمەتریلکە** / şemet(i)rîlke/: ☜ شەمەترێلکە

**شەمەترێکە** / şemet(i)rêke/: ☜ شەمەترێلکە

**شەمەترێلکە** / şemet(i)rêlke/: نـاو. شـەمەترێنکە؛ شــــەمەتریکە؛ شــــەمەتریلکە؛ شــــەمەترێکە؛ شەمەتلێنکە؛ شەمەسرێلکە؛ هـەنگێکی بـاریکی ڕەشکەڵەیە شانە لە ناو دڕکانـدا هەڵدەبەسـتێ و هەنگوینی زۆر خۆش دروست دەکا ☰ نوعی زنبور وحشی کە عسل مرغوبی دارد

**شەمەترێنکە** / şemet(i)rênke/: ☜ شەمەترێلکە

**شەمەتلێنکە** / şemet(i)lênke/: ☜ شەمەترێلکە

**شـەمەخولە** / şemexule/: ناوەلـناو. گێـلگـەوج؛ حەپۆل ☰ ابلە

**شـەمەد** / şemed/: نـاو. شـــەمەو؛ پۆپـــەشمین؛ پێخەفێکی زۆر تەنک لـە کـەتان یـان پـەمۆ کـە هاوینان بە خۆیدا دەدەن ☰ شَمَد

**شەمەسرێلکە** / şemes(i)rêlke/: ☜ شەمەترێلکە

**شەمەلە** / şemele/: ☜ شەمشەمەکوێرە

**شەمەلەکۆرە** / şemelekore/: ☜ شەمشەمەکوێرە

**شەمەڵەکۆرە** / şemełekore/: ☜ شەمشەمەکوێرە

**شـەمەن** / şemen/: نـاو. پایەبـــەرزی ئـــایینی شەمەنپەرستی، کـە بـە بـڕوای شـوێنکەوتوانی دەتوانێ لەگـەڵ بوونـەوەرانی نادیـاردا پێوەنـدی دابمەزرێنێ، نەخۆش چا کاتەوە و لە نادیار خەبەر بدا ☰ شَمَن

**شەمەنپەرسـتی** / şemenperistî/: نـاو. دیـــنی پەرەسەندوو لە نێوان گـەلانی ئـوراڵ ـ ئاڵـتایی باکووری ئاسیا و ئورووپا لە سەر بنەمای باوەڕ بـە

چەن خودا، ڕۆحی باپیران و دێوانێ کە تەنیا شەمەنەکان پەیوەندیان لەگەڵیاندا هەیە 🇮🇷 شَمَن‌پرستی

**شەمەند / şemend/**: ئاوەڵناو. زەق و قیتی جوان و لەبەرچاو 🇮🇷 شکیل

**شەمەندەفەر / şemendefer/**: ناو. قەتاری ڕێی ئاسن 🇮🇷 ترن؛ قطار

**شەمەنیخە / semenîxe/**: ناو. ١. دۆخی پێسری یەکتر گرتن و دەگژ یەک ڕاچوون ٢. کاری کێشانی شتی قورس بە نیخەنیخ 🇮🇷 ١. حالت دست به یقه شدن ٢. عمل هن‌هن کشیدن جسم سنگین

**شەمەو / şemew/**: ☜ شەمەد

**شەمیت[1] / şemît/**: ناو. شەمت؛ خلیسک 🇮🇷 جای لیز

**شەمیت[2]**: ئاوەڵناو. کەڵەکەکراو؛ بە سەر یەکداکراو 🇮🇷 برهم انباشته

**شەمیتۆک / şemîtok/**: ناو. جێگەی خلیسکان 🇮🇷 لیزگاه

**شەمیتین / şemîtîn/**: چاوگ. ١. خلیسکان؛ شەمتین ٢. هاویشتنە سەر یەک 🇮🇷 ١. لیز خوردن ٢. برهم انباشتن

**شەمیخ / şemîx/**: ناو. ڕەوتی ترشان؛ کەف کردن؛ خرا بوون؛ بۆن گرتن 🇮🇷 فرایند کف کردن و تُرشیدن

**شەمیخین / şemîxîn/**: چاوگ. ترشانی چێشت لە بەر گەرما 🇮🇷 فاسد شدن غذا از گرما

**شەمیران / şemîran/**: چاوگ. پێکهاتن؛ جێ‌بەجێ بوون 🇮🇷 درست شدن کار

**شەمیراندن / şemîrandin/**: چاوگ. بە ئەکام گەیاندنی کار؛ ئەنجام دان؛ پێک‌هێنان بە تەواوی 🇮🇷 به انجام رساندن

**شەمیک / şemîk/**: ناو. ڕێسمەی درگا 🇮🇷 پاشنەی در

**شەمێ / şemê/**: ناو. مۆم؛ مێو: ١. بالمەمی ٢. کراژ 🇮🇷 ١. شمع ٢. موم

**شەمێلە / şemêle/**: ناو. ١. شەمۆلۆوە؛ دانەوێڵەیەکە گاجووتی پێ قەڵەو دەبێ ٢. ☜ شەماڵە 🇮🇷 ١. نوعی غله که به گاو می‌دهند ٢. ☜ شماله

**شەن / şen/**: ناو. ١. شەنە؛ داری چوارچنگی خۆیان بە بادان ٢. کاری خۆیان هەڵاویشتن ٣. کا و کۆتێ کە دە تەندووری دەڕێژن ٤. دارچکێکی خۆڕسکی کوێستانە، بە لق‌وپۆی زۆر و گەڵای خڕی دوو لەپەوە 🇮🇷 ١. افشون؛ چنگک ٢. کار خرمن باد دادن ٣. کاه و خاشاکی که در تنور می‌ریزند ٤. نوعی درختچه‌ی کوهستانی

⊡ **شەن کردن**: خۆیان بە با دان 🇮🇷 خرمن باد دادن

**بە باری خۆدا شەن کردن**: *[کینایە]* هەر بە قازانجی خۆ قسە کردن و جووڵانەوە 🇮🇷 بە سود خود عمل کردن

**لە هەر لایەکەوە با بێ شەن کردن**: *[کینایە]* هەمیشە لایەنی قازانج و کەڵکی خۆ گرتن «لە هەر لایەکەوە بابێ، شەن ئەکا «مەسەل»» 🇮🇷 نان به نرخ روز خوردن

**شەناخ / şenax/**: ☜ شمراخ

**شەنای / şenay/**: چاوگ. وەشاندن 🇮🇷 انداختن

**شەند / şend/**: ناو. دەنووک؛ دندووک 🇮🇷 منقار

**شەندە / şende/**: جێناو. شەنە؛ ناوی نامەعلووم «شەندە لە مەندە کەمتر نییە» 🇮🇷 فُلان

**شەندەلی / şendelî/**: ئاوەڵناو. ١. دندووکدار؛ دەنووکدار ٢. ددانەدار؛ بە دیانە و داڵبڕی تیژەوە لە لێوار و کەناردا 🇮🇷 ١. دارای منقار ٢. دندانه‌دار

**شەنکەر / şenker/**: ناو. شەنەدێر؛ کەسێ کە خۆیان شەن دەکا 🇮🇷 کسی که خرمن باد می‌دهد

**شەنکێش / şenkêş/**: ناو. نگێر؛ شانە؛ چەوکێش؛ درەغ؛ خاکژن؛ پاچەکوڵە؛ ئامرازێکی دەم بەرەوخوار، وەک چنگاڵێکی زۆر گەورە، بۆ پاککردنەوەی زەوینی کشت‌وکاڵ لە زیخ و

کەند و کولۆ ☰ شن‌کش

**شەنگ**[1] / şeng/: ناو. ١. شڕ و شاتاڵی ناو ماڵ ٢. فیشەک؛ تیری تفەنگ ٣. هێز؛ قەوەت ‹شەنگی ڕۆشتنم نییە› ☰ ١. خرت‌وپرت خانە ٢. فشنگ ٣. توان

**شەنگ**[2]: ئاوەڵناو. ١. جوان و لەبار ٢. بە نەشە و گەشە ‹تای بەڕەزای شەنگ نە پای مەغاران/ پەشێوەن چوون زولف تەعزیەداران «مەولەوی»› ☰ ١. رعنا ٢. بانشاط

**شەنگار** / şengar/: ☜ **شەنگاڵ**

**شەنگاڵ** / şengał/: ناو. شەنگار؛ پێکۆترە؛ کاهووەکەرانە؛ چەرمەژووری؛ گوڵەئەشکەوت؛ گیایەکی دەرمانییە ☰ شنگار

**شەنگاو** / şengaw/: ناو. شەقاو؛ هەنگاوی بەرز ☰ گام بُلند

**شەنگست** / şengist/: ناو. ١. پرنسیب؛ دامەزراوی؛ جێکەوتوویی ٢. بەندیواری؛ بارودۆخی بە شتێکەوە بەند بوون ☰ ١. پرنسیب ٢. وابستگی

**شەنگستە** / şengiste/: ناو. بنگەهـ؛ بنەڕەت؛ پایە ☰ شالوده

**شەنگکێش** / şengkêş/: ناو. گەلەنگەدەن؛ کۆلاسە ☰ گلنگدن

**شەنگڵ** / şengił/: ناو. ١. شنگڵ؛ شڵنگە؛ کاری لە خۆ نەوین ٢. چۆنیەتی پێکەوە نووسان ☰ ١. عمل تکان به خود دادن ٢. چگونگی به هم چسبیدن

⊡ **شەنگڵێکی خۆ دان**: لە خۆ نەوین؛ هیممەت کردن ‹هەستە شەنگڵێکی خۆت بدە! عەیبە، چۆن وا دەبێ؟› ☰ خود را تکانی دادن

**شەنگڵە** / şeng(i)łe/: ☜ **شملّی‌براکە**

**شەنگڵەبەرەکەت** / şeng(i)łebereket/: ☜ **شملّی‌براکە**

**شەنگڵەبەرەکەتە** / şeng(i)łeberekete/: ☜ **شملّی‌براکە**

**شەنگۆڵ**[1] / şengoł/: ☜ **شملّی‌براکە**

**شەنگۆڵ**[2]: ئاوەڵناو. زۆر لە سەر کەیف و دڵخۆش ☰ شنگول

**شەنگۆڵە** / şengołe/: ☜ **شەشە**

**شەنگە** / şenge/: پاشگر. شەنگ: ١. جوان و لەبار ‹شەنگەبێ› ٢. بەهێز و تاقەت و توان ‹شەنگەدار› ☰ ١. رعنا ٢. توانا

**شەنگەبەرە** / şengebere/: ☜ **شملّی‌براکە**

**شەنگەبێ** / şengebî/: ☜ **شۆڕەبی**

**شەنگەبێری** / şengebêrî/: ناو. ١. بێری جوان و لەبەردڵان ٢. سەلارە ژن ☰ ١. دختر شیردوش رعنا ٢. کدبانوی رعنا

**شەنگەتوو** / şengetû/: ناو. دارەتووی بەرز و لەگەشە ☰ درخت توت بلند و بانشاط

**شەنگەدار** / şengedar/: ناو. شەنگەستە؛ شەنگەشڕە؛ داری جوان و لەبار ☰ درخت شاداب و جوان

**شەنگەستە** / şengeste/: ☜ **شەنگەدار**

**شەنگەسوورە** / şengesûre/: ناو. ژەنگەسوورە؛ سوورەمۆزە ☰ زنبور قرمز

**شەنگەشڕ** / şengeşiř/: ناو. بەرگی شڕ و کۆنە ☰ رخت کُهنه و پاره

**شەنگەشڕە** / şengeş(i)ře/: ☜ **شەنگەدار**

**شەنگەشەپاڵ** / şengeşepal/: ئاوەڵناو. زۆر جوان و لەبەردڵان ☰ بسیار زیبا

**شەنگی** / şengî/: ناو. جوانی؛ لەباری ☰ زیبایی

**شەن‌وکەو** / şen û kew/: ناو. کار و ڕەوتی شەن کردن و لە بێژنگ دانی دەغڵ بۆ دەرکردنی پڵ‌وپووش و کۆزەر ☰ بوجاری

⊡ **شەن‌وکەو کردن**: ١. خاوێن کردنەوەی دەخڵ ٢. *[مەجاز]* لێکۆڵینەوە؛ لێکدانەوە ٣. *[مەجاز]* گاڵە پێ کردن؛ حەشر کردن ٤. *[کینایە]* بێ بەرگر و خۆف، بە هەموو بارێکدا پەل هاویشتن ☰ ١.

بوجاری کردن ٢. پژوهیدن ٣. معرکە کردن ۴. آزادانە هر کاری کردن

**شەنە** / şene/: ناو. ١. ☜ **شەن-١** ٢. گەنمێ کە هێشتا کاتی دروێنەی نەگەیشتووە ☳ ١. ☜ **شەن-١** ٢. گندم نرسیدە برای درو

**شەنەبا** / şeneba/: ناو. شەنەوا؛ کاری شەن کردن و خەرمان بە با دان ☳ عمل باد داد خرمن

**شەنەدێر** / şenedêr/: ☜ **شەنکەر**

**شەنەوا** / şenewa/: ☜ **شەنەبا**

**شەنەوان** / şenewan/: ئاوەڵناو. نەرمان ☳ نرم (زمین)

**شەنی** / şenî/: ئاوەڵناو. کرێت؛ خوێنتاڵ؛ ئێسک‌گران ☳ بدترکیب

**شەنیار** / şenyar/: ناو. شەنکەر؛ شەنەدێر ☳ کسی کە خرمن بە باد می‌دهد

**شەنیان** / şenyan/: ☜ **شنین**

**شەنیای** / şenyay/: ☜ **وەشیتران**

**شەو** / şew/: ناو. شەڤ؛ شەڤ؛ مەودای نێوان دوو ڕۆژ لە تاریک بوونی هەواوە تا ڕوون بوونەوەی بەیانی ☳ شب

▣ **شەو چلە**: شەو زمسان؛ یەکەم شەوی زستان ☳ شب یلدا

**شەو زمسان**: ☜ **شەو چلە**

**شەوی ئەحیە**: هەرکام لە دە شەوی ئاخری مانگی ڕەمەزان (زۆرتر شەوانی تاق) ☳ شب احیاء

**شەوی بەرات**: شەوی پازدەی مانگی هەشتەمی کۆچی ـ مانگی ☳ شب برات

**شەوی قەدر**: دە شەوی ئاخری مانگی ڕەمەزان ☳ دە شب آخر رمضان

▣ **شەو بە سەردا هاتن**: شەو داهاتن و نەگەیشتنە بەرەوە ‹نابەڵەد بووین، شەومان بە سەردا هات و کەوتینە ناو پنچک و داری دەم چەم «هەژار، چێشتی مجێور»› ☳ شب فرارسیدن و بە مقصد نرسیدن

**شەو داهاتن**: بوون بە شەو ☳ شب فرارسیدن

**شەوی دە شەو بەزین** *[کینایە]* شەو دە شەودا بوون؛ درێژ بوونی شەو لە وەرزی پاییزدا ☳ طولانی شدن شب‌ها در پاییز

**شەو دە شەودا بون**: ☜ **شەو دە شەو بەزین**

**شەو زرینگانەوە** شەو درەنگ بوون؛ لە نیوەی شەو لا دان ☳ شب از نیمە گذشتن

**شەو شەق بون**: شەو لە نیوە لادان ☳ شب از نصفە گذشتن

**شەو شەق کردن**: شەو لە نیوە لادان و نەخەوتن ☳ شب زندەداری کردن

**شەوات** / şewat/: ناو. سووتمان؛ ڕەوتی ئاگر بەر بوونەوە ☳ حریق؛ آتش‌سوزی

**شەواتە** / şewate/: ئاوەڵناو. تەواو سووتاو ☳ کاملاً سوختە

**شەواتەک** / şewatek/: ناو. چێوی سووتەمەنی؛ ئێزنگ و قەڵاشکەری ☳ چوب سوختنی

**شەواخون** / şewaxûn/: ☜ **شەوخونی**

**شەوادی** / şewadî/: ناو. دوێشەو؛ دوێنێ‌شەو ☳ دیشب

**شەوادیتر** / şewadîtir/: ناو. پێرەشەو؛ پێرێشەو؛ دوو شەو پێش ☳ پریشب

**شەوار** / şewar/: ناو. شەوارە؛ شەفتاری؛ شەڤتاری؛ تەنگی نوێژی شێوان ☳ شباهنگام؛ بعد از غروب

**شەوارکی** / şewarkî/: ناو. شەونشینی ☳ شب‌نشینی

**شەوارە**[1] / şeware/: ناو. شەڤارە؛ ڕاوی مەل لە شەو بە چرا ☳ شکار پرندە در تاریکی با چراغ

**شەوارە**[2]: ئاوەڵناو. شەڤارە؛ شەوکوێر بە هۆی تیشکی بەقەوەت کەوتنە نێو چاوانەوە ☳ شبکور از تابیدن نور شدید

▣ **شەوارە بوون:** شەوارە کەوتن؛ کەوتنە دوای شەوارەوە 🇮🇷 از نور چراغ بە دام افتادن

**شەوارە کردن:** چاو هەتەر نەکردن بە هۆی نووری زۆرەوە ‹مەڵومۆری لە ناو هێلانە خەوتوو/ ئەیانکا شەوقی شۆلەی شەم، شەوارە «کاک ئەحمەد»› 🇮🇷 از شدت نور دید نداشتن

**شەوارە کەوتن:** ☜ **شەوارە بوون**

**شەواژۆ / şewajo/:** ناو. شەڤیە؛ کار و ڕەوتی لەوەڕاندنی مێگەل بە شەو 🇮🇷 عمل چراندن گله در شب

**شەواشینک / şewaşînik/:** ناو. بەری دارێکە وەک بادامی ورد دەیکوڵێنن و دەخورێ 🇮🇷 ثمری شبیه بادام

**شەواک / şewak/:** ئاوەڵناو. بێ‌هۆش؛ گێلۆکە 🇮🇷 دبنگ سادەلوح

**شەوال / şewal/:** ☜ **شەواڵ**

**شەواڵ / şewał/:** ناو. شەوال: ١. شواڵ؛ شەرواڵ ٢. مانگی شەشەکان؛ مانگی دەیەمی ساڵی کۆچی ـ مانگی 🇮🇷 ١. شلوار ٢. ماه شوال

**شەواڵبەکۆڵ / şewałbekoł/:** ☜ **شەرواڵبەکۆڵ**

**شەواڵەسوورە / şewałesûre/:** ☜ **شەرواڵبەکۆڵ**

**شەواڵەمۆر / şewałemor/:** ☜ **شەرواڵبەکۆڵ**

**شەوان / şewan/:** ناو. شەوانە؛ شەوار؛ کاتی شەو 🇮🇷 شبانگاه

**شەواندەر / şewander/:** ☜ **چەوەندەر**

**شەوانڕۆژ / şewanřoj/:** ناو. شەووڕۆژ 🇮🇷 شبانەروز

**شەوانڕۆژی / şewanřojî/:** ئاوەڵناو. تایبەت بە شەووڕۆژ 🇮🇷 شبانەروزی

**شەوانە[1] / şewane/:** ☜ **شەوان**

**شەوانە[2]:** ئاوەڵناو. تایبەت بە شەو ‹کاری شەوانە› 🇮🇷 شبانە

**شەوانە[3]:** ئاوەڵکار. بە شەودا ‹شەوانە ڕژانە نێو ماڵەکەی و بردیان› 🇮🇷 شبانە

**شەوانەڕۆژ / şewaneřoj/:** ناو. شەو و ڕۆژ؛ ڕۆژگار ‹شەوانەڕۆژم بۆتە کار کردن› 🇮🇷 روزگا؛ شب و روز

**شەواو / şewaw/:** ناو. ئاوێ کە بە شەو لە زرعات دەنرێ 🇮🇷 آبیاری شبانە

**شەوب / şewb/:** ناو. پەتا؛ ئاهۆ؛ نەخۆشی گیرۆ 🇮🇷 بیماری واگیر

**شەوبا / şewba/:** ناو. سرووەی شەوانە 🇮🇷 نسیم شبانە

**شەوباش / şewbaş/:** دۆعا. شەوخۆش؛ شەوێکی خۆش؛ ڕێزوشەیێ کە دە شەودا بۆ سڵاو و ماڵئاوایی دەگوترێ، واتا هیوادارم شەو بە خۆشی بەرنە سەر. بەرانبەر: **ڕۆژباش** 🇮🇷 شب بەخیر

**شەوبگار / şewb(i)gar/:** ئاوەڵکار. شەونەشەو؛ شەوناشەو 🇮🇷 شب‌درمیان

**شەوبوێر / şewb(i)wêr/:** ئاوەڵکار. شەوبێر؛ شەونەشەو؛ شەوناشەو 🇮🇷 یک شب درمیان

**شەوبۆ / şewbo/:** ناو. شەوبۆن؛ شەوبۆسان؛ شەڤبۆ؛ گیابەن؛ گیایەکی ڕازێنەیی، بە گوڵی چوارپەڕی بۆنخۆش و زەرد یان زەردی ئامال قاوەیی یان سوور، خورمایی، بنەوش، گەڵای ساکاری باریک و نووک‌تیژ و تووکنەوە 🇮🇷 شب‌بو

**شەوبۆسان / şewbosan/:** ☜ **شەوبۆ**

**شەوبۆن / şewbon/:** ☜ **شەوبۆ**

**شەوبەک / şewbek/:** ناو. وەردێنە؛ تیرەنان؛ تیرۆکی ئەنگوتک پان کردنەوە 🇮🇷 وردنە

**شەوبەن / şewben/:** ناو. ١. داری درگا لە پشتەوە داخستن ٢. کۆستەکی خەنجەر 🇮🇷 ١. کلون در ٢. تسمەی آویختن خنجر بە کمر

**شەوبەند / şewbend/:** ناو. جۆرێ زەمبەری بە سنجاخ گیرەوە لە سەرپۆش و سەروێنی دەدەن ‹شەدەی لارەپێچ وە شەوبەندەوە/ پشت سەر وە برقەی دەرزیبەندەوە «بەدبەخت»› 🇮🇷 نوعی سنجاق زینتی دستار زنانه

**شەوبەندەڕۆژ / şewbendeřoj/**: ناو. کۆلکەزێرینە ☰ رنگین‌کمان

**شەوبەیار / şewbeyar/**: ☜ **شەوبێدار**

**شەوبین / şewbîn/**: ناو. دۆخی وشک بوونی چێندراو بەر لە کاتی خۆی ☰ حالت خشک شدن ناهنگام کشتزار

**شەوبێدار / şewbêdar/**: ئاوەڵناو. شەوبەیار؛ شەونخوون؛ شەونەخووس؛ شەووریا؛ شەوڕاب؛ شەونشین؛ خاوەن ئۆگرەتی بە شەوبێداری ☰ شب‌زنده‌دار

**شەوبێداری / şewbêdarî/**: ناو. شەوخوونی؛ شەونخوونی؛ شەونخووسی؛ شەونەخووسی؛ شەونوخوونی؛ دۆخ یان چۆنیەتی شەو بێدار مان، پتر لەگەڵ چالاکییەکی تایبەتدا ☰ شب‌زنده‌داری

**شەوبێر / şewbêr/**: ☜ **شەوبوێر**

**شەوبێری / şewbêrî/**: ☜ **شەونشینی**

**شەوپاتە / şewpate/**: ئاوەڵناو. شەوەساره؛ شەو لێنراو بۆ ڕۆژێ دادێ ‹ترخێنەی شەوپاتە خۆشە› ☰ ویژگی غذایی که شب برای فردا می‌پزند

**شەوپەڕ / şewpeř/**: ناو. کاری هەڵفڕینی کەو لە کاتی بوومەلێڵی بەیانیدا ‹کێ دەزانێ خەیالی بن لێفەم/ چۆن بە سەر کەوشەنا دەکا شەوپەڕ؟ «هێمن»› ☰ عمل پریدن کبک هنگام سپیده‌دم

**شەوت / şewt/**: ناو. نەخۆشییەکی ناو گوێی ئاژاڵە ☰ نوعی بیماری گوش دام

**شەوتا / şewta/**: ناو. شەفتا؛ شەڤتا؛ شەوتێ؛ تای شەوانە؛ نۆبەتێ لە شەودا ☰ تب شبانه

**شەوتان / şewtan/**: چاوگ. شەوتین؛ سووتان؛ ئاگر تێچوون ☰ سوختن

**شەوتاندن / şewtandin/**: چاوگ. سووتاندن ‹خاینێن شنگالێ هاتنە تالان کرن و پاشان هاتنە شەوتاندن› ☰ سوزاندن

**شەوتاندۆخ / şewtandox/**: ئاوەڵناو. سووتێن ☰ سوزاننده

**شەوتک / şewtik/**: ناو. سووتەمەنی؛ سووتەنی ☰ سوخت

**شەوتی / şewtî/**: ئاوەڵناو. سووتاو؛ سووزیاگ ‹دایکەکا کوردا جگەر شەوتی› ☰ سوخته

**شەوتین / şewtîn/**: ☜ **شەوتان**

**شەوتێ / şewtê/**: ☜ **شەوتا**

**شەوجمعانە / şewcim'ane/**: ناو. چێشت و نانێ بۆ خێری مردوو لە شەوی هەینیدا بەش دەکرێتەوە ☰ خوراکی که شب‌های جمعه برای ثواب مُرده می‌بخشند

**شەوچرا / şewç(i)ra/**: ناو. ١. چرای شەوارە؛ چرای ڕاوی مەل لە تاریکاییدا ٢. شەودرۆش؛ جەواهێراتێ کە لە شەودا دەتروسکێ ‹تۆی تازە نەمامی باخی ژینێ/ تۆی گەوهەری شەوچرای زەمینێ «هەژار، *مەموزین*»› ٣. چرایێ کە شەوانە بۆ ڕووناکی هەڵیدەکەن ‹ناوت بووە شەوچرا لە بەرمان/ بۆ دەردی دەروون دەبێتە دەرمان «هەژار، *مەموزین*»› ☰ ١. چراغ شکار پرنده در شب ٢. گوهر شب‌چراغ ٣. چراغ شب‌افروز

**شەوچلە / şewç(i)le/**: ناو. شەو زمسان؛ درێژترین شەوی ساڵ ☰ شب یلدا

**شەوچەپکەن / şewçepken/**: ناو. کراسی ئاودامێنی ژنان کە بەتایبەتی شەو دەیپۆشن ☰ پیراهن دامن بلند زنانه که شب می‌پوشند

**شەوچەرە / şewçere/**: ناو. شەوچەلە؛ شەوچەرەز؛ خواردنێ کە لە شەوبێری دەخورێ ‹شەوچەرەم کردوی وە سەحەرچەرە!/ گشتی کەل کردوی ئەڕای مەسخەرە «شامی»› ☰ شبچره

**شەوچەرەز / şewçerez/**: ☜ **شەوچەرە**

**شەوچەلە / şewçele/**: ☜ **شەوچەرە**

**شەوخاب / şewxab/**: ☜ **شەوخەف**

**شەوخۆش / şewxoş/**: ☜ **شەوباش**

**شەوخوون** / şewxûn/: ☜ **شەوخوونی**

**شەوخوونی** / şewxûnî/: ناو. شەڤخووونی؛ شەووەخوون؛ شەبیخوون؛ شەوخی؛ شەبەیخوون؛ شەوخوون؛ شەوخوونی؛ شەواخوون: ١. باسخوون؛ چەیخوون؛ شەویۆلغار؛ کار و ڕەوتی دابەڕزانی شەوانە بۆ سەر دژمن ٢. شەوبێداری؛ شەونخوونی؛ شەونخووسی؛ شەونەخووسی؛ شەونوخوونی؛ دۆخ یان چۆنیەتی شەو بێدار مان، پتر لەگەڵ چالاکییەکی تایبەتدا ☰ ١. شبیخون ٢. شب‌زنده‌داری

**شەوخەف** / şewxef/: ناو. شەوخەو؛ شەوخاب: ١. بەرگی خەوێ؛ جلکی ناو نوێن ٢. چراخەو؛ چرایێکی کز کە لە کاتی نووستندا هەڵیدەکەن ٣. بەستۆکەیێ لە سەر شەوەوە تا بەیانی لای پیاو دەمێنێتەوە ☰ ١. لباس خواب ٢. چراغ خواب ٣. بدکاره‌ای که از ابتدای شب تا صبح نزد مرد می‌ماند

**شەوخەو** / şewxew/: ☜ **شەوەخەف**

**شەوخەیبە** / şewxeybe/: ئاوەڵناو. پەڕپووت؛ نابووت (مرۆڤ و مالات) ☰ بدریخت کوچک اندام (آدمی و احشام)

**شەوخی** / şewxî/: ☜ **شەوخوونی**

**شەوداوەت** / şewdawet/: ناو. هەڵپەڕکێی شەوانە ‹زستانان لە ئاخەڵ و هۆڵاندا شەوداوەتمان دەگرتن «هێمن»› ☰ رقص دسته‌جمعی شبانه

**شەودرۆش** / şewd(i)roş/: ☜ **شەوچرا ـ ٢**

**شەودەر** / şewder/: ☜ **شەوەر**

**شەودێر** / şewdêr/: ☜ **شەودێری**

**شەودێری** / şewdêrî/: ناو. شەودێر؛ بە شەو ئاودانی زرعات ☰ آبیاری شبانه

**شەودێز** / şewdêz/: ناو. شەبدێز: ١. تارمایی لە شەودا ٢. یەکسمی ڕەش بە پنۆکی سپییەوە ‹خوسرەو کە نەبا سواری شەودێز/ شیرین لە شەکر دەبوو بە پەرویز «هەژار، مەموزین»› ☰ ١. شبح ٢. ستور سیاه رنگ با خال‌های سفید

**شەورگ** / şewirg/: ☜ **شەوەر**

**شەوڕاب** / şewřab/: ☜ **شەوبێدار**

**شەوڕاو** / şewřaw/: ناو. ڕاوی شەوانە ☰ شکار شبانه

**شەوڕن** / şewřin/: ناو. ١. کاری ڕنینی بێستان بە شەودا ٢. دزی لە بێستان لە شەودا ‹دێم و هەڵدەمژم شنەی کوێستانی کورد/ دێم و دەچمە شەوڕنی بێستانی کورد «هێمن»› ☰ ١. چیدن از باغ در شب ٢. دزدی شبانه از باغ

**شەوڕۆ** / şewřo/: ئاوەڵناو. شەوڕەو؛ شەوگەرد؛ شەوگەڕ؛ شەوگێڵ؛ بە تایبەتمەندی ڕۆیین لە شەودا. هەروەها: **شەوڕۆیی** ☰ شبرو

**شەوڕەنگ**[1] / şewřeng/: ناو. ١. ☜ **شەوە ـ١** ٢. ماکێکی ڕەنگییە، لە تاریکیدا بەر تیشک بکەوێ، دەدرەوشێتەوە ☰ ١. ☜ **شەوە ـ١** ٢. شبرنگ

**شەوڕەنگ**[2]: ئاوەڵناو. ١. بە ماکێکی ڕەنگی کە لە تاریکیدا تیشک بداتەوە ٢. شەڤین؛ ڕەش؛ زۆر تاریک و تنۆک وەکوو شەو ☰ ١. شبرنگ ٢. بسیار سیاه

**شەوڕەو**[1] / şewřew/: ناو. ١. کاری ڕاکردن لە دەست دوژمن لە شەودا ٢. جۆرێ کرمی نۆکە، لە بن خۆڵەوە ڕیشەکەی دەخوا ☰ ١. فرار در شب ٢. نوعی کرم آفت نخود

⊡ **شەوڕەو کردن**: ١. ڕاکردن بە شەو ٢. ڕادانی مێگەل لە سەر پەچە بە شەودا ☰ ١. فرار کردن در شب ٢. بردن گله در شب

**شەوڕەو**[2]: ☜ **شەوڕۆ**

**شەوڕەوی** / şewřewî/: ناو. ١. شەوڕۆیی ٢. کاری شەو ڕەو کردن ☰ ١. شبروی ٢. فرار در شب

**شەوژەن** / şewjen/: ناو. ١. شەوبەن؛ داری دەرگا لە ژوورەوە داخستن ٢. کۆستەکی خەنجەر ☰ ١.

کلون در ٢. بند خنجر
⊡ **شەوژمن کردن:** گالەدان؛ داخستنی دەرکە بە شەوژەن ☰ کلون در را انداختن
**شەوسان** / şewsan/: ☜ **شەبستان**
**شەوسکڵ** / sews(i)kił/: ناو. خۆیانی وردی هێشتا تەواونەبوو ☰ خرمن نیم‌کوبیده
**شەوسوتکە** / şewsutke/: ناو. ١. کوانێکی بەژانە لە دەست و پا دیێت ٢. جۆرێ زیپکەی وردی سوورە لە منداڵی ساوا دیێت ☰ ١. دُملی که بر دست و پا می‌زند ٢. نوعی جوش قرمز بر بدن نوزاد
**شەوسۆ**[1] / şewso/: ناو. شەوسوو؛ بەیانی؛ سبەی ☰ فردا
**شەوسۆ**[2]: ئاوەلکار. شەوسوو؛ بەیانی ‹ئابرام شەوسۆ تێتەو› ☰ فردا
**شەوسۆتکە** / şewsotke/: ناو. شەوسۆتەکە؛ جۆرێ پێشکە ☰ نوعی پشه
**شەوسۆتەکە** / şewsoteke/: ☜ **شەوسۆتکە**
**شەوسو** / sewsû/: ☜ **شەوسۆ**
**شەوسین** / sewsîn/: چاوگ. لارەولار ڕۆیشتن ☰ تلوتلو خوردن
**شەوش** / şewş/: ناو. پەرێشانی؛ بێ‌سەرەوبەرەیی ‹تەن وە شەوش و ڕەنگ کلاوزێرەوە/ دیدە وە نیگای شۆڕشگێرەوە «مینەجاف»› ☰ پریشانی؛ درهم‌برهمی
**شەوشاندن** / şewşandin/: چاوگ. شێواندن ☰ بە هم ریختن
**شەوشەمەکێ** / şewşemekê/: ☜ **شەماڵە**
**شەوشین** / şewşîn/: چاوگ. پەرێشان بوون؛ بێ‌سەرەوبەرە بوون ☰ آشُفتن
**شەوفڕ** / şewfiř/: ☜ **شەفۆك**
**شەوق** / şewq/: ناو. ١. ڕۆشنایی ٢. تاسە و ئارەزوو ‹سوارە غارغارێن، ڕەقس و سەما و زەوق/ لەنجە و کناچاو، مەلا مارۆ شەوق «مەلا حەسەن دزلی»› ٣. کەیفخۆشی؛ شادی ‹بەزم شەوق و عەیش نە دەروون جەمەن/ ئانە هیچ نەبۆ نە دەروون، خەمەن «مەولەوی»› ☰ ١. روشنی ٢. اشتیاق ٣. شوق
⊡ **شەوق دان:** تروسکان؛ درەوشین ☰ درخشیدن
**شەوق دانەوە:** تروسکانەوە؛ تیشک دانەوە ‹وا ڕۆژ هەلات لە بەندەنی بەرزی وڵاتەوە/ خوێنی شەهیدە ڕەنگی شەفەق شەوق ئەداتەوە «پیرەمێرد»› ☰ منعکس شدن پرتو
**شەوق کردن:** بە دڵخۆشی ڕابواردن؛ کەیف کردن ☰ کیف کردن
**شەوق لە سەر بوون:** ☜ **شەوق لێ‌بوون**
**شەوق لێ بوون:** شەوق لە سەر بوون؛ بە دڵ پێ خۆش بوون ☰ رغبت داشتن
**شەوق هەبوون:** دڵ پێوە بوون؛ مەیل لێ بوون ‹شەوقی بە دەرسەکەی نییە› ☰ مُشتاق بودن
**شەوقدار** / şewqdar/: ئاوەلناو. ١. خاوەن شەوق ٢. هۆگر ☰ ١. روشن ٢. علاقه‌مند
**شەوک** / şewk/: ناو. شەوکە: ١. دەرزیلە؛ زەنبەرێکە لە سەروپێچی دەدەن ٢. قولاپی ماسی گرتن ☰ ١. زیور روی دستار ٢. قُلاب ماهیگیری
**شەوکار** / şewkar/: ئاوەلناو. شەڤکار؛ خاوەن چالاکی پیشەیی لە شەودا ‹کرێکاری شەوکار› ☰ شبکار
**شەوکاری** / şewkarî/: ناو. کارێ کە لە شەودا بەڕێوە بچێ ☰ شبکاری
**شەوکراس** / şewk(i)ras/: ناو. کراسی ناو نوێن ☰ پیراهن خواب
**شەوکلاو** / şewk(i)ław/: ناو. کلاوخەو؛ کلاوێکی پتر نەرمچن و بێ‌لێوارە کە لە ماڵ یان شەوانە کاتی نووستن دەیکەنە سەر ☰ شبکُلاه
**شەوکوت** / şewkut/: ناو. چەتەی شەو ☰ راهزن (شبانه)
**شەوکوێر** / şewk(i)wêr/: ئاوەلناو. شەڤکۆر؛

شـــەوکوور؛ شـــەوکۆر؛ شـــەوکۆرە؛ ترتـــەمیس؛ گەڕەکوێر؛ تووشیاری نەخۆشی شـەوکوێری ‹بـە هەرچی چاوی دینی عیشقی تێدا شاهیدی سـیدقە/ بە هەرچی دیدەیی عەقلی تیـا شـەوکوێر و حەیرانـە «نالی»› ☰ شبکور

**شـەوکوێری** / şewk(i)wêrî/: نـاو. شـــەوکۆری؛ شـــەوکووری؛ شەڤـکۆری؛ گـەڕەکوێری؛ لاوازی سۆمای چاو، لە شەو یان لە ڕووناکایی زۆر کەمدا ☰ شبکوری

**شەوکۆر** / şewkor/: ☜ **شەوکوێر**

**شەوکۆرە**[١] / şewkore/: ☜ **شەمشەمەکوێرە**

**شەوکۆرە**[٢]: ☜ **شەوکوێر**

**شەوکۆری** / şewkorî/: ☜ **شەوکوێری**

**شەوکۆک** / şewkok/: ناو. کەسـێ کـە خەڵـک لـە خەوی بەشەو خەوەر دەکاتەوە ☰ آن که مـردم را از خواب شبانه بیدار کند

**شەوکوور** / şewkûr/: ☜ **شەوکوێر**

**شەوکووری** / şewkûrî/: ☜ **شەوکوێری**

**شەوکە** / şewke/: ☜ **شەوك**

**شەوکەت** / şewket/: ناو. ١. جوانچاکی؛ جوانخاسی ٢. گەورەیی و پایەبەرزی ☰ ١. جمال ٢. جلال

**شەوکەران** / şewkeran/: ناو. شۆکەران؛ دووڕەست؛ مارەکوشە؛ زڕگێژنۆک: ١. ڕوەکێکـە لـە تـیرەی گێزەر، بە گوڵی چـەتری سـپی و قـەد سـەوزی پنکە ـ پنکە سوورەوە کـە بـۆنێکی پیسـی وەک بۆنی مشکی لێ دێ، ماکێکی ژەهراوی سرکەری لێ دەگرن بە نـاوی «کـونین» یـا «کونوسـین»، جاران دەرخواردی تاوانباران دەدرا بۆ کوشـتنیان ٢. ژاری ئەم گیایە ☰ ١و٢. شوکران

**شەوکێڵ**[١] / şewkêł/: نـاو. کەسێ بـە شـەو جـووت دەکا ☰ کسی که شبانه شخم می‌زند

**شەوکێڵ**[٢]: ناوەڵناو. شێفبڕاو بە شەو ☰ شـخم‌زده در شب

**شەوگ** / şewig/: ☜ **شەوە**

▣ **شەوگ گرتن**: ☜ **شەوە بینین**

**شەوگا** / şewga/: ناو. شەڤین؛ جێگەی پشوو دانی شەوانەی ئاژەڵ لە دەشت ☰ شبغازه

**شەوگار** / şewgar/: نـاو. شـەووار؛ شـەو؛ شـەوێ ‹پاییز شەوگاری درێژە› ☰ شبانگاهان

**شەوگر** / şewgir/: ناو. شەوگرتی؛ کەسێ شـەونوێژ دەکا و ناخەوێ ☰ کسی که نماز شب می‌خواند

**شەوگرتی** / şewgirtî/: ☜ **شەوگر**

**شـەوگڕ** / şewgiř/: نـاو. چراخـان؛ چراخـانی ☰ چراغان

**شەوگور** / şewgur/: ناو. شەڤگور؛ کازێوە؛ بوولێڵـە؛ دۆخی بەیان بەربوون ☰ گرگ‌ومیش اوّل بامداد

**شەوگورد** / şewgurd/: ناو. ١. لاوێک کـە لـەم دێ بۆ ئەو دێ بە شەودا دەڕوا بۆ ژوان ٢. نیوە جاجم؛ نیوە بەرماڵ (دوو شەوگورد دەبێتە بەرماڵێک) ☰ ١. شبگرد ٢. نیمەی طولی جاجیم و سجاده

**شـەوگەرد**[١] / şewgerd/: نـاو. جـۆرێ مارمێلکـە دەڵێن پێوە دەدا ☰ نوعی مارمولک

**شەوگەرد**[٢]: ☜ **شەوڕۆ**

**شەوگەڕ**[١] / şewgeř/: ناو. ١. شەوگێڕ؛ ئاسیاوێ کـە هەر بە شەو ئەگـەڕێ ٢. میـوانی و هەڵـپەڕکێی شەوی پێش زەماوەند ٣. جۆرێک ماری بۆرە، بـە شـــەودا دەگـــەڕێ ٤. ڕەوتی گـەڕانی شـــەوانە (بەتایبـەت ماڵـەوماڵ کـردن) ‹هـەر کەسـێ نـەیکا شەوگەڕ ماڵەوماڵ/ عومری با ئەیبا بە سۆزەی شەماڵ «فولکلۆر»› ٥. ئەو کەسەی دەچـێ بـۆ میـوانی و هەڵپەڕکێی شەوانە ‹ پێش ئەوەی لاوی بەختـەوەر دەم راگوێزێ لەسەر خالان/ پێش ئەوەی شـەوگەڕی دڵـتەڕ وەڕەز بـێ لـە ماڵـەوماڵان «هـێمن»› ☰ ١. آسیاب شبکار ٢. مراسم شب قبل از عروسی ٣. نوعی مار شبگرد ۴. شبگردی ۵. آن کـه بـه مهمـانی‌هـای شبانه می‌رود

**شەوگەڕ**[٢]: ☜ **شەوڕۆ**

**شەوگەشە** / şewgeşe/: ناو. پاقلەمارانـــــە؛ گوڵهەورێشم ☲ شب‌خُسب

**شەوگێڕ** / şewgêř/: ☜ **شەوگەڕ**[١]-١

**شەوگێڵ** / şewgêł/: ☜ **شەوڕۆ**

**شەول** / şewl/: ناو. ١. دەشتایی نێوان چیا ٢. تینی گەرما ☲ ١. جُلگە ٢. گرما

⊡ **شەول دان**: تینی تاو دادانی هاوینان ☲ هُرم گرفتن

**شەولە** / şewle/: ناو. ١. جێگەی پەین هەڵخستنی توونخانە ٢. کەوای پڕپینەی دەروێش ☲ ١. شولەی گُلخن ٢. قبای مُندرس دراویش

**شەولەبان** / şewleban/: ناو. ١. *[کیایە]* سەگی پاسەوانی ماڵ ٢. *[باوەڕی کۆن]* شتێکی خەیاڵاوی کە منالیان پێ دەترساند ‹بە شەودا خۆفناکم تا بەیانی/ لە ترسی شەولەبان و خێوی کانی «موفتی پێنجوێنی»› ٣. باگردان؛ بانگلێر؛ بانگلان ☲ ١. سگ نگهبان خانه ٢. موجودی خیالی برای ترساندن کودک ٣. بام‌غلتان

**شەولەش** / şewleş/: ناوەڵناو. *[پلار]* تەمبەڵ؛ تەنبەڵ ☲ تنبل

**شەولەوەڕ** / şewleweř/: ناو. شەوەکەژ؛ کاری چەرینی ئاژەڵ لە شەودا ☲ شب‌چرای گله

**شەومە** / şewme/: ناو. تاڤهەیڤ؛ تریفە ☲ مهتاب

**شەومەن** / şewmen/: ☜ **شەومەنە**

**شەومەندە** / şewmende/: ☜ **شەومەنە**

**شەومەنە** / şewmene/: ناوەڵناو. شەڤی؛ شەومەن؛ شەومەندە؛ شەوی؛ پاشماوە لە شەوی ڕابردوو ‹بەیانیان ... هەر ئاوێکی شەومەندە بوو، دەیبردەوە کانی و لەو سەر، ئاوی تازەی دێنا! «هەژار، چێشتی مجێور»› ☲ شب‌مانده

**شەومیزی** / şewmîzî/: ناو. ناکچیری؛ دیاردەی فرە میزتنی شەوانە، واتە فرە بوونی جارەکانی هەستان لە خەو بۆ میز کردن ☲ ناکچری؛ تکرر ادرار شبانه

**شەوناشەو** / şewnaşew/: ناوەڵکار. شەوبێر؛ شەوبوێر؛ شەونەشەو ☲ یک شب درمیان

**شەونامە** / şewname/: ناو. بلاڤۆکی نهێنی کە بە شەو بلاو دەکرێتەوە ☲ شب‌نامه

**شەونخوسی** / sewn(i)xûsî/: ☜ **شەوبێداری**

**شەونخون** / sewn(i)xûn/: ☜ **شەوبێدار**

**شەونخونی** / sewn(i)xûnî/: ☜ **شەوبێداری**

**شەونشین** / sewn(i)şîn/: ☜ **شەوبێدار**

**شەونشینی** / sewn(i)şînî/: ناو. شەوبێری؛ شەڤبۆری؛ شەڤرۆنک؛ شەڤرەڤینک؛ شەڤهەری؛ زیگار؛ ئالایش؛ میوانی شەوانە؛ دۆخ و دابی شەو لە دەوری یەک کۆ بوونەوەی دۆست و خزم و خێزان ☲ شب‌نشینی

**شەونم** / şewnim/: ناو. شەڤنم؛ شەڤنەم؛ شەوی؛ ئاڤی؛ ئاڤێ؛ خناف؛ خناو؛ خوناو؛ خوناڤ؛ ئانگوو؛ ئاونگ؛ ئاهنگ؛ هاوان؛ خۆ؛ خۆی؛ خوه؛ ئۆه؛ خووسە؛ ڕێل؛ دنگ؛ ئاڵشت؛ ئاڵشتە؛ ئاوشە؛ قەراو؛ بەشگ؛ وردەتنۆکی نمی هەوا کە بەتایبەت لە شەودا دەنیشێتە سەر شتی سارد ☲ شبنم

**شەونوخونی** / şewnuxûnî/: ☜ **شەوبێداری**

**شەونوێژ** / sewn(i)wêj/: ناو. نوێژ لە شەوا پاش هێندێ خەوتن ☲ تهجُّد

**شەونەخوس** / şewnexûs/: ☜ **شەوبێدار**

**شەونەخوسی** / şewnexûsî/: ☜ **شەوبێداری**

**شەونەشەو** / şewneşew/: ناوەڵکار. شەوناشەو؛ شەونەشەوێ؛ شەوبگار؛ شەوێ نە شەوێ ‹شەونەشەو سەری لێ ئەدەین› ☲ شب‌درمیان

**شەونەشەوێ** / şewneşewê/: ☜ **شەونەشەو**

**شەووار** / şewwar/: ☜ **شەوگار**

**شەووریا** / şewwirya/: ☜ **شەوبێدار**

**شەووریشــە** / şeww(i)rîşe/: نــاو. چاوبریقـــــە؛ گوڵئەستێرە ☰ کرم شبتاب

**شەووڕۆژ**[١] / şew û řoj/: ناو. شـەو بـێ یـان ڕۆژ؛ تاریــک و ڕوون ‹شــەووڕۆژم وەکــوو یــەکن› ☰ شب‌وروز

**شەووڕۆژ**[٢]: ئاوەڵکار. هــەموو دەم بــێ‌پســانەوە ‹شەووڕۆژ خەو ناچێتە چاو/ کەنگێ بەرم دەکەوێ ئاو «مەلا ئاوارە»› ☰ همیشە؛ شبانەروز

**شـەووڕۆژی** / şew û řojî/: ئاوەڵنـاو. دایمـــی؛ هەمەوەختی ☰ شبانەروزی

**شەوونی** / şewunî/: ناو. شوانی ☰ چوپانی

**شەووەخوون** / şewwexûn/: ☜ **شەوخوونی**

**شەوە** / şewe/: نـاو. شەڤـە؛ شــەوێ؛ شــەوگ: ١. شەوڕەنگ؛ شیا؛ بەردێکی بـەنرخی کانگـایی لـە جــۆری لیگنـــیتی ڕەق، ڕەش و بریقـــەدار کــە هێلەساو دەدرێ و لە گەوهەرسازیدا بـە کـار دێ ٢. *[باوەڕی کۆن]* ئاڵ؛ هاڵ؛ جنۆکەی سـاواخنکێن ٣. مۆتە؛ مۆتەکە ☰ ١. شبه ٢. آل ٣. بختک

◘ **شەوە بردنەوە:** *[باوەڕی کۆن]* مـردنی سـاوا بـە هـۆی جنۆکـەی سـاواخنکێن ☰ مُردن نـوزاد توسط جن نوزادکش

**شەوە بینین:** شەوە دیتن؛ شەوگ گرتن؛ مۆتەکە لە خەوا دیتن ☰ کابوس در خواب دیدن

**شەوە دیتن:** ☜ **شەوە بینین**

**شەوەخوار** / şewex(i)war/: نـاو. گیـای تــەڕ بـۆ شەولەوەڕ ☰ علف تازە برای شبچرای دام

**شەوەخوون** / şewexûn/: ☜ **شەوخوونی**

**شەوەر** / şewer/: ناو. شەبدەر؛ شەڤدەر؛ شــەودەر؛ شەوەرگ؛ شەورگ؛ شەوەری؛ شــەوەڕ؛ شـاودەر؛ شــوور؛ هەنــدەقۆ؛ هەنــدەکۆ؛ هنــدکۆ؛ هەنەکــە؛ بارێزە؛ دانۆک؛ سێپەڕە؛ سێوەرە؛ گیایەکی ئالفی گوڵداری یەکساڵە، دووساڵە یان پایایە بە گەڵای سێپەڕەیی و هێشووەگوڵــی خــڕی ئـاڵ، ســوور، ئەرخەوانی، سپی یان دووڕەنگەوە کە بۆ لـەوەڕی ماڵات دەچێندرێ ☰ شبدر

**شەوەرگ** / şewerg/: ☜ **شەوەر**

**شەوەری** / şewerî/: ☜ **شەوەر**

**شەوەڕ** / şeweř/: ☜ **شەوەر**

**شەوەزەنگ** / şewezeng/: ناو. شەوەنیا؛ شەوی زۆر تاریک و ئەنگوستەچاو ‹لە بەر تۆزی سواران، ڕۆژی ڕووناک و تاووساو، ببووە شەوەزنگێکی ئەنگوسـت لـە چاو «هەژار، *شەرەفنامە*»› ☰ شب دیجور

**شەوەسارە** / şewesare/: ☜ **شەوپاتە**

**شەوەکەژ** / şewekej/: ☜ **شەولەوەڕ**

**شەوەکی**[١] / şewekî/: نـاو. بـەیانی: ١. شــەوەکیان؛ بەرەبەیان؛ شەبەقی ٢. سبەی؛ سۆزی؛ شەوسۆ ☰ ١. بامداد ٢. فردا

**شەوەکی**[٢]: ئاوەڵکار. ١. شــەوانە؛ شــەوەکیانە؛ بــە شەودا ٢. سبەی؛ سۆزی؛ شەوسۆ ☰ ١. شبانە ٢. فردا

**شەوەکیان** / şewek(i)yan/: ☜ **شەوەکی**[١]**ـ١**

**شەوەکیانە** / şewek(i)yane/: ☜ **شەوەکی**[٢]**ـ١**

**شـەوەکێف** / şewekêf/: ئاوەڵنـاو. شــەو لــە کــەژ خــەوتوو؛ تایبەتمەنـدی کەسـێ کـە بـۆ کـار یـا شــتی‌تـر، شــەو لــە ســەری بـاخ و بێســتانییەوە دەمێنێتەوە ☰ ویژگی کسی کە شـب را در مزرعـە می‌ماند

**شەوەناو** / şewenaw/: ئاوەڵکار. شــەوێک لەپــڕ و نـــەکاو ‹شـــەوەناوێک بـــە ســـەرماندا دەدەن و کەلەپچەمان دەکەن!› ☰ شب‌هنگامی

**شەوەنگ** / şeweng/: ناو. تاریکایی شـەو ☰ تیرگـی شب

**شەوەنیا** / şewen(i)ya/: ☜ **شەوەزەنگ**

**شـــــەوهاندن** / şewhandin/: چـــــاوگ. ١. تێکەڵوپێکەڵ کردن ٢. بیچم ناحەز کردن ☰ ١. درهم‌برهم کردن ٢. بدشکل کردن

**شەوی**[1] / şewî/: ناو. ١. شەی؛ کراس؛ گجی ٢. دەخلێ کە زوو پێبگا ٣. ☜ **شەویلاك** ☰ ١. پیراهن ٢. غلەی زودرس ٣. ☜ **شەویلاك**

**شەوی**[2]: ☜ **شەومەنە**

**شەویاری** / şewyarî/: ناو. زیگار؛ شەونشینی؛ میوانی شەوانە ☰ شب‌نشینی

**شەویل** / şewîl/: ☜ **شەویلاك**

**شەویلاک** / şewîlak/: ناو. شەوی؛ شەویل؛ شەویلکە؛ شەویلاکە؛ شەویلە؛ لاچناکە؛ لاچلاچ؛ لاچلاچک؛ ئەملا و ئەولای چەنە؛ هەرکام لە دوو پێشەی بان و خواری دەم ☰ آرواره

**شەویلاکە** / şewîlake/: ☜ **شەویلاك**

**شەویلکە** / şewîlke/: ☜ **شەویلاك**

**شەویلە** / şewîle/: ☜ **شەویلاك**

**شەوین**[1] / şewîn/: چاوگ. چەمانەوە؛ کۆمیانەوە ☰ خمیدن

**شەوین**[2]: ناو. ١. ☜ **شەوێن** ٢. شەوڕەنگ؛ ڕەش بە ڕەنگی شەو ☰ ١. ☜ **شەوێن** ٢. سیاه

**شەوین**[3]: ئاوەڵناو. ١. بە ڕەنگی شەو؛ شەوڕەنگ ٢. کۆم؛ چەمیو ☰ ١. سیاه ٢. خمیده

**شەویۆڵغار** / şewyołğar/: ☜ **شەوخونی ـ١**

**شەوێ**[1] / şewê/: ☜ **شەوە**

**شەوێ**[2]: ئاوەڵکار. شەوێک: ١. شەوەکی؛ کاتی شەو ‹شەوێ هاتن و بردیان› ٢. بە شەوێک ‹شەوێ چوار سەعات کتێبی دەخوێند› ☰ ١. شبانگاه ٢. شبی

**شەوێت** / şewêt/: ئاوەڵناو. بەیدەس؛ قوشقی؛ خۆگرتوو بە سڵ کردن ‹ئەو ئەسپە شەوێتە، وریای خۆت بە!› ☰ رموک

**شەوێق**[1] / şewêq/: ئاوەڵناو. پەریشان و بێسەرەوبەرە ☰ پریشان‌حال

**شەوێق**[2] / şewêq/: پێرۆ. ← **شلوشەوێق**

**شەوێک** / şewêk/: ☜ **شەوێ**[2]

**شەوێن** / şewên/: ناو. شەوین؛ شەڤی؛ شەڤین: ١. کاتی لەوەڕاندنی ئاژەڵ بە شەو ٢. جێگەی شەوانەی پشوودانی ئاژەڵ ☰ ١. شبچرا ٢. شبغاز

**شەه** / şeh/: ناو. ١. شە؛ شانەی سەر و کوڵکە ٢. شا؛ شاه؛ پادشا؛ پاتشا ٣. شەت؛ ڕووباری گەورە ٤. پۆپەی کەڵەباب ☰ ١. شانەی سر یا پشم صاف‌کن ٢. شاه ٣. شط ۴. تاج خروس

⊡ **شەه کردن**: شانە کردنی سەر ☰ شانە زدن مو

**شەهادە** / şehade/: ناو. ١. شایەتی؛ ئاگاداری لە ڕووداو ٢. بڕوانامەی خوێندن ‹خوێندن بۆ شەهادە هەڵەیە› ☰ ١. شهادت؛ گواهی ٢. گواهینامەی تحصیلی

**شەهان** / şehan/: چاوگ. شەهاندن؛ شاندن؛ ناردن؛ ڕەوانە کردن ☰ فرستادن

**شەهاندن** / şehandin/: ☜ **شەهان**

**شەهبەن** / şehben/: ناو. قەیتان؛ بەنۆک؛ پەتک ☰ قیطان

**شەهت** / şeht/: ئاوەڵناو. شەپلەلێدراو؛ دەستوپێشل و بێهەست ☰ فلج

**شەهتی** / şehtî/: ☜ **شەختی**

**شەهتین** / şehtîn/: چاوگ. لە تینگی مردن ☰ مردن از تشنگی

**شەهر** / şehr/: ناو. ١. ☜ **شار ـ١** ٢. شەدەی سەری ژنان ☰ ١. ☜ **شار ـ١** ٢. سربیچ زنانه

**شەهرڤانی** / şehrvanî/: ☜ **شارەوەری**

**شەهرواری** / şehrwarî/: ☜ **شارەوەری**

**شەهرەزا** / şehreza/: ☜ **شارەزا**

**شەهریە** / şehr(i)ye/: ناو. هەڕشتە؛ ڕشتە ☰ رشتەی آشی

**شەهک** / şeh(i)k/: ناو. ١. شانەی چکۆلەی سەرداهێنان ٢. کونە؛ مەشکۆلەی ئاو کێشان ☰ ١. شانەی کوچک ٢. مشک کوچک آب

**شەهلول** / şehlûl/: ☜ **شالور**

**شەهلەوەند** / şehlewend/: ئاوەڵناو. ١. شۆخ و شەنگ ٢. سوارچاک ‹شەرڤانەکی شەهلەوەندە› ≡ ١. خوش‌سیما ٢. یکەسوار

**شەهمار** / şehmar/: ناو. شەحرمەحر؛ شەمار؛ هەزارپێ؛ زیلو ≡ هزارپا

**شەهمێر** / şehmêr/: ئاوەڵناو. جوامێر ≡ رادمرد

**شەهن** / şeh(i)n/: ناو. شەهـ؛ شە؛ شانە ≡ شانەی سر

**شەهنک** / şehnik/: ناو. خاڵی سەر گۆنا ≡ خال گونە

**شەهوان** / şehwan/: ناو. بەردەلان ≡ سنگلاخ

**شەهو** / şehû/: ناو. ڕێگەی زۆر دژواری بەرداوی ≡ راه سنگلاخ دشوارگُذر

**شەهی** / şehî/: ☜ **شەهید**

**شەهید** / şehîd/: ناو. شەهی؛ کەسێ کە لە پێناوی خەبات بۆ ئامانجەکانی دەکوژرێ ‹پێی ناوێ بۆ شەهیدی وەتەن، شیوەن و گرین/ نامرن ئەوانە وا لە دڵی میللەتا ئەژین «پیرەمێرد»› ≡ شهید

**شەهین**[1] / şehîn/: چاوگ. حیلانـدن؛ هیڕانـدن؛ نریخانن ≡ شیهە کشیدن

**شەهین**[2]: ناو. ١. تەرازوو ٢. شاهێنی تەرازو ≡ ١. ترازو ٢. شاهین ترازو

**شەهێن** / şehên/: ناو. ١. شاهێن ٢. ناوی دارێکە ≡ ١. شاهین ٢. درختی است

**شەی**[1] / şey/: چاوگ. شای؛ وەشاندن ≡ انداختن

**شەی**[2]: ناو. شەوی؛ کراس؛ گجی ≡ پیراهن

**شەیپور** / şeypûr/: ناو. بۆری؛ زورنای لەشکر ≡ شیپور

**شەیپورچی** / şeypûrçî/: ناو. بۆریەژەن؛ بۆریژەن؛ کەڕەناچی ≡ شیپورچی

**شەیپورژەن** / şeypûrjen/: ناو. بۆریژەن؛ کەڕەناچی ≡ شیپورچی

**شەیپوری**[1] / şeypûrî/: ناو. گوڵە کاردوو؛ گوڵە هاز ≡ گُل شیپوری

**شەیپوری**[2]: ئاوەڵناو. کەڕەنایی؛ وەکوو شەیپوور ≡ شیپوری

**شەیتان**[1] / şeytan/: ناو. ئەهریمەن: *[ئایین]* ١. ئیبلیس؛ دۆزاک؛ فریشتەیێ کە بە هۆی ملنەدان بە فرمانی خودا، لە ئاسمانی بەرزەوە دەرکرا و هاتە زەوی تا خەڵک هەڵفریوێنێ و بەرەو خراپەکاری و گوناهیان ببا ٢. *[کینایە]* هەر هێزێکی نادیاری خراپەکار ≡ ١و٢. شیطان

◘ **شەیتان پێکەنین:** *[مەجاز]* شەیتانی بوون؛ ئاو هاتنەوە لە خەودا ≡ احتلام شدن

**شەیتان چونە بن کڵێشەوە:** *[مەجاز]* بە شوێن کارێکی ناحەزەوە بوون ≡ شیطان تو جلد (کسی) رفتن

**شەیتان**[2]: ئاوەڵناو. *[کینایە]* ١. شووفار و ئاژاوەچی ٢. زرنگ؛ زیرەک ٣. بزێو؛ هاروهاج ≡ ١. مُفتن ٢. زرنگ ٣. شیطان

**شەیتانئاوس** / şeytan'awis/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ١. تایبەتمەندی گیسکی دووبەهارە کە زگی پڕ ببێ ٢. تایبەتمەندی گیاندارێک کە زگی ئاوسابێ، وا بزانن ئاوسە و ئاوسیش نەبێ ≡ ١. ویژگی بُز دو سالەی آبستن ٢. آبستن‌نما

**شەیتانبازاڕ** / şeytanbazař/: ناو. *[کینایە]* بازاڕی ڕەش و پڕفێڵ و تەڵەکە ≡ شیطان‌بازار

**شەیتانپەرس** / şeytanperis/: ☜ **شەیتانپەرست**

**شەیتانپەرست** / şeytanperist/: ناو. شەیتانپەرس؛ یەزیدی؛ ئێزدی؛ داسنی ≡ یزیدی

**شەیتانپێکەنیو** / şeytanpêkenîw/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* بلۆق؛ بالغ؛ پێگەیشتوو ≡ بالغ

**شەیتانلغاو** / şeytanl(i)ğaw/: ناو. کاری بەستنی لێوی خوارووی یەکسم بە هەوسار لە باتی لغاو ≡ عمل بستن لب زیرین ستور به جای لگام

**شەیتانۆکە** / şeytanoke/: ناو. ١. چاوشەیتانە؛

هێلکەشـەیتان؛ شەیتانەکڵـە؛ نـاخوونشـەیتان؛ نینۆکەشەیتان؛ گونەشەیتانە؛ کەسپک؛ قەپۆچکە؛ حاجکەدووگوێچکـە؛ قەپۆشـکە؛ قەپووشـک؛ سـەرینمـار؛ خایـەمار؛ گیانـدارێکی نێرـ مـای بچووکی نەرم و شل، بە دوو جـووت شـاخۆکەوە کە چاوی لە سەر جووتێکیانە و قاپێلکەیەکی لـە سەر کۆڵە، خۆی تێدا دەشارێتەوە ٢. قاپێلکی ئەو گیاندارە ☰ ١. حلزون ٢. صدف حلزون

**شـەیتانـەڕێ / şeytanerê/**: نـاو. *[کینایـە]* دزەڕێیـە؛ ڕێگای حەشاردراو ☰ راه مخفی

**شەیتانەکڵە / şeytanek(i)łe/**: نـاو. شـەیتانۆکە ☰ حلزون

**شەیتـانی[1] / şeytanî/**: ناو. *[کینایە]* ١. بـیر و کـاری خـراپ ٢. دووزمـانی ☰ ١. فکـر و کـار زشـت ٢. سخن‌چینی

**شەیتانی[2]**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* پێوەندیدار بە شەیتانەوە ‹پێکەنینی شەیتانی؛ پیلانی شەیتانی› ☰ شیطانی

⊡ **شەیتانی بـوون**: *[مەجاز]* ١. ئاو هاتنەوە لە خـەودا ٢. باڵق بوون ☰ ١. احتلام شدن ٢. بالغ شدن

**شـەیتـانیکـەر / şeytanîker/**: ئاوەڵـناو. بــەدکار؛ بەزاجکەر ☰ دوبهمزن

**شـەیـدا / şeyda/**: ئاوەڵـناو. ئەویـنـداری بـەتەرەف؛ دیوانەی عەشق ‹بولبولی شەیدا؛ مەجنوونی شەیدا› ☰ شیدا

**شەیدانک / şeydanik/**: ناو. کونجی ☰ کُنجد

**شەیدایی / şeydayî/**: ناو. شێتی ☰ شیدایی

**شەیژ / şeyj/**: ☜ **سریش**

**شەیشتی / şeyiştî/**: ناو. شەسـت؛ شـەس؛ شـەش چەل دە ☰ شصت

**شەیلە / şeyle/**: ☜ **شلوێ**

**شـەیـەتوێتۆن / şeyet(i)wîton/**: نـاو. گێژەڵـووکە؛ گەردەلوول؛ باگێژە ☰ گردباد

**شه / ş(i)h/**: ناو. پوورەهەنگ ☰ کندوی زنبور

**شهاندن / ş(i)handin/**: چاوگ. شـهین؛ حیلانـدن ☰ شیهه کشیدن

**شهە / ş(i)he/**: نـاو. حینـە؛ حیلـەی ئەسـپ ☰ شیهەی اسب

**شهەفی / ş(i)hefî/**: ناو. جۆرێ تـرێ کـە درەنـگ پێدەگا ☰ نوعی انگور دیررس

**شهەینی / ş(i)heynî/**: ناو. جۆرێ ترێی سـپی کـە زوو پێدەگا ☰ نوعی انگور سفید زودرس

**شهی / ş(i)hî/**: ناو. نزگەرە؛ نزێرە ☰ سکسکە

**شـهین / ş(i)hîn/**: چـاوگ. ١. حیلانـدن؛ حیلـە کردنی ئەسپ ٢. خوێندنی کەڵەباب ٣. قـۆزین؛ کـۆکین؛ کـۆخین ☰ ١. شـیهە کشـیدن اسـب ٢. خواندن خروس ٣. سُرفە کردن

**شی[1] / şî/**: ☜ **شوـ١**

⊡ **شی کرن**: ☜ **شو کردن**

**شی[2]**: ↓

⊡ **شی بونەوە**: ١. لە بەر یەک هەڵوەشان ٢. باش لێکدرانەوە ☰ ١و٢. حلاجی شدن

**شی کردنەوە**: ١. هەلاجی کردن؛ لـە بـەر یـەک هەڵوەشاندنەوە (خوری) ٢. بـاش لێکدانـەوە و تۆژینەوەی باسێک. هەروەها: **شـی کرانـەوە** ☰ ١و٢. حلاجی کردن

**شیا / ş(i)ya/**: ☜ **شەوە ـ١**

**شیارۆک / ş(i)yarok/**: نـاو. خیگـە؛ خییـە؛ هیـزە؛ پێستەی ڕزق تێ کردن ☰ خیگ

**شیارە / ş(i)yare/**: ☜ **شارا**

**شیافیک / ş(i)yafîk/**: نـاو. گیایەکە بۆ ڕەوان بـوون دەیخۆن ☰ گیاهی مُسهل

**شیاق / ş(i)yaq/**: نـاو. جـۆرێ کووتـاڵ ☰ نـوعی قُماش

**شیاکە / ş(i)yake/**: نـاو. ڕیـخ؛ سـنێر؛ سـەرین؛ پیسایی گا و مانگا ☰ سرگین تر

**شیاکاوی / ş(i)yakawî/**: ئاوەڵناو. ڕیخاوی؛ ڕیخ‌پـێ

هەڵپڕژاو ☰ سرگین‌آلود

**شیان** / ş(i)yan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //شیای؛ دەشێی؛ بشێ// ١. توانین؛ لە دەست هاتن ٢. ڕۆیشتن؛ چوون ٣. لێوەشانەوە؛ لێ‌هاتن ٤. بوون؛ شیاو بوون ‹ئەمە بۆ تۆ ناشێ› ☰ ١. توانستن ٢. رفتن ٣. از پس (کاری) برآمدن ٤. شایستن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: شیاو/ چاوگی نەرێنی: نەشیان

**شیاندن** / ş(i)yadin/: ☜ **شاندن**

**شیانست** / ş(i)yanist/: ئاوەڵناو. شایان ☰ سزاوار

**شیاو** / ş(i)yaw/: ئاوەڵناو. ١. لایق؛ هێژا ٢. شیای؛ ڕۆیشتوو ٣. ناردراو ☰ ١. شایسته ٢. رفته ٣. فرستاده شُده

**شیاوی** / ş(i)yawî/: ناو. لێهاتوویی؛ ژێهاتوویی؛ لێهاتگی؛ شایەنی؛ هێژایی ☰ شایستگی

**شیای**[1] / ş(i)yay/: چاوگ. ١. چوون ٢. لێ وەشانەوە ٣. شیاو بوون ☰ ١. رفتن ٢. توانستن ٣. شایستن

**شیای**[2]: ئاوەڵناو. ١. ☜ **شیاو-٢** ٢. تۆپیو؛ کەوتی ☰ ١. ☜ **شیاو-٢** ٢. سَقَط شده

**شیاین** / ş(i)yayin/: چاوگ. تۆپین؛ کەوتین؛ سەکەت بوون ☰ سَقَط شدن

**شیب** / şîb/: ئاوەڵناو. ڕزیوی لەکارکەوتوو ☰ پوسیده

**شیبا** / şîba/: ناو. ١. ڕووناکی و بریقە ٢. سووکەبای شەوانە ☰ ١. روشنی و شوق ٢. نسیم شبانه

**شیبرەو** / şîbrew/: ☜ **شبرەو**

**شیبەڵەک** / şîbełek/: ناو. دوو ڕەنگی سوور و سپی ☰ خلنگ سُرخ و سفید

**شیپ** / şîp/: ناو. ١. گووپ؛ گوپ؛ پێست و گۆشتی نێوان شەویلکە و سەر گۆنا ٢. سیرمەی قامچی ٣. پەتی سەر قامچی لە کایەی تەرخولاندا ٤. ڕنوو؛ شاپە؛ هەرەس ٥. لافاوی بەتەوژم ٦. جۆرێ پلنگ ٧. ☜ **شیپە -٢** ☰ ١. لُپ؛ زیر گونە ٢. تسمەی شلاق ٣. نخ پارچەای کە در بازی با گردنا بر سر چوب بندند ٤. بهمن ٥. سیلاب ٦. نوعی پلنگ ٧. ☜ **شیپە -٢**

**شیپان** / şîpan/: ☜ **شیپانە**

**شیپانە** / şîpane/: ناو. شیپان؛ چوارچێوەی درگا ☰ چهارچوب در

**شیپک** / şîpik/: ناو. ١. پاژنەی درگا ٢. شیپ؛ گووپ؛ گوپ ☰ ١. پاشنەی در ٢. لُپ؛ زیر گونە

**شیپۆر** / şîpor/: ناو. تووڕەیی؛ قەڵسی ☰ خشم

**شیپۆڕ** / şîpoř/: ↓

⊡ **شیپۆڕ بڕین**: داڕزاندن؛ شڕ و شیتاڵ کردن ☰ پارە - پارە کردن

**شیپۆڕان** / şîpořan/: ناو. گوڕە و هەرای بە تووڕەیی ☰ غُرّش

**شیپۆک** / şîpok/: ئاوەڵناو. منگن؛ بە تایبەتمەندی لە لووتدا قسە کردن ☰ ویژگی کسی کە تودماغی حرف می‌زند

**شیپە** / şîpe/: ناو. ١. ئامرازێکە لە نیر و ئامووردا ٢. شیپ؛ پانایی تیخ ٣. لاشیپانەی درگا ٤. حیلەی ئەسپ ٥. سیرمەی شەلاخ ٦. شەپۆل؛ پێل ☰ ١. ابزاری در خیش ٢. پهنای تیغ ٣. چوب‌های کناری چهارچوب در ٤. شیههی اسب ٥. تسمەی تازیانە ٦. موج

**شیپەل** / şîpel/: ☜ **شەپۆل**

**شیپەلک** / şîpelik/: ☜ **شەپۆلك**

**شیپیلک** / şîpîlik/: ناو. پانکراس ☰ لوزەالمعدە

**شیت**[1] / şît/: ناو. فیتوو؛ فیکە؛ فیقە؛ دەنگی تیژ لە ناو لێو دەرخستن ☰ سوت

**شیت**[2]: ئاوەڵناو. زرینگ؛ وریا ☰ هُشیار

**شیتاڵ** / şîtał/: ناو. تیتاڵ؛ بزگوڕ ☰ کُهنەپارەی لباس

**شیتاڵ - شیتاڵ** / şîtał şîtał/: ئاوەڵناو شڕووڕ؛ تەواو

دڕاو ☰ پاره ـ پوره

**شیتان** / şîtan/: ئاوەڵناو. نەرم و کەفەڵـۆک (زەوی) ☰ نرم مُتخلخل (زمین)

**شیتانن** / şîtanin/: چـاوگ. شـاتاندن؛ زیقانـدن؛ زیڕاندن ☰ جیغ کشیدن

**شیتک** / şîtik/: ناو. شووتگ؛ پشتێند ☰ کمربند

**شیتو** / şîtû/: ☜ **شوتی**

**شیته**[1] / şîte/: ناو. *[پلار]* شیتەشیت؛ قسەی بن‌شـڕ و بێ‌تام ☰ سُخن یاوه

**شیته**[2]: دەنگەناو. شیتەشیت: ١. *[پلار]* زیقه و هـەرا ٢. فیته؛ فیکه؛ فیقه ☰ ١. جیغ و داد ٢. سوت

**شیتەشیت** / şîteşît/: ☜ **شیته**

**شیتەک** / şîtek/: ناو. فیت‌فیتـه؛ ئـامرازی فیتـه ☰ سوتک

**شیتەوێژ** / şîtewêj/: ئاوەڵناو. *[پلار]* ١. دەمهەڵـەی قسەقۆڕ ٢. وازوازی؛ سەرسەری ☰ ١. یـاوه‌گـو ٢. دمدمی

**شیتین** / şîtîn/: ئاوەڵـناو. شـیرتین؛ شـلەتێن؛ شیلەوگەرم ☰ ولرم

**شیخاڵ** / şîxał/: ناو. باریکـه بـەفری ڕچـاوی پـەنا ڕەشانگ که درەنگ دەتوێتەوه ‹دێم بەرەوه بەفر و چلووره و بەستەڵەک/ دێم بەرەو شیخاڵ و ڕێچکـه و ڕەشبەڵەک «هێمن»› ☰ باریکه‌ای از برف یخ‌زده که دیر آب می‌شود

**شیخره** / şîxre/: ناو. دمەتیخی زۆر تیژ ☰ تیغ تیز

**شیخەڵ** / şîxeł/: ناو. شـخەڵ؛ شـەخەڵ ١. کـاری پـەرتاوتن؛ داپـاچینی لکـی دار ٢. جێگـەی بـه دەوەن ☰ ١. هرس درخت ٢. بوته‌زار

**شیدانی** / şîdanî/: نـاو. تـۆوی بـەزری کـەتانی (گیایه‌که) ☰ بذر کتان

**شیر** / şîr/: ناو. ١. سووت؛ شۆت؛ ئەوەی له گوان و مەمک دەدۆشرێ ٢. شمشێر؛ شێر؛ شوور؛ شـوڕ؛ شمشێرد؛ شەمشێر؛ شمشیر؛ قلیج؛ قلیچ؛ قلینج؛ قلـنج؛ گـۆرد؛ جـەنگ‌ئـامێرێکی پۆلایینـە، بـه دەستەیەکی کورت و تێغەیـەکی درێـژەوه ☰ ١. شیر ٢. شمشیر

▣ **شیری چۆلەکە:** *[مەجاز]* شـیر مـەلیچک؛ شـاخی مێرووله؛ شتی نایاب و نەگونجاو ☰ شیر مُرغ

**شیری میران:** خۆراکی تایبەتی مەلەکەی هـەنگ که له لووی سەری هەنگی کارکەرەوه دەدەڵێ ☰ شیرەی عسل، خـوراک ویـژەی ملکـەی زنبـور عسل

**شیرێ زنج:** فرۆ ☰ آغوز

⊡ **شیر بـۆ دان:** *[کینایـه]* ١. بـەخێروبێر بـوون ٢. قازانج کردن (له کڕینی ئـاژەڵ، بەتایبـەت) ☰ ١. برکت داشتن ٢. سود بُردن (بویژه از خرید دام)

**شیر پێدان:** ١. ☜ **شیر دان** ٢. شیر به منالـێ بێچگه منالی خـۆ دان ☰ ١. ☜ **شـیر دان** ٢. شیر دادن به کودک غیر

**شیر حەڵاڵ کردن:** *[کینایه]* ڕازی بوونی دایـک لـه منداڵی ☰ شیر را حلال کردن

**شیر خواردن:** ١. لەبەر مەمکان بوون ٢. مـەمک مـژین ٣. *[پلار]* جـارێ منـداڵ بـوون ☰ ١. شیرخواره بودن ٢. پستان مکیدن ٣. دهن بوی شیر دادن

**شیر دادان:** شیر پێ دان؛ شیر له مەمک و گوان ڕژاندن ☰ شیر دادن

**شیر دان:** شیر پێدان؛ شـیر بـه بێچـوو دان ☰ شیر دادن

**شیر دۆشین:** شیر لـه گـوان هێنانـه دەر ☰ شـیر دوشیدن

**شیر ڤەخارن:** شیر خواردنەوه ☰ شیر خوردن

**شیر ڤەکرن:** ☜ **له شیر گرتنەوه**

**شیر(ی) کەسێ به کەسێ دان:** له شـیری منداڵـی بەرمەمکەی خۆ به منداڵـی تـر دان ☰ از شـیر کودک شیرخوار خود به کودک دیگر دادن

**شیر(ی) یەک خواردن:** برا و خوشکی شیری بوون ⇐ برادر و خواهر شیری بودن

**بۆی شیر لە دەم کەسێ هاتن:** *[پلار]* جاریٚ منداڵ بوون؛ بۆ کاریٚ نەشیان ⇐ بوی شیر از دهان کسی آمدن

**لە شیر برینەوە:** ☜ **لە شیر گرتنەوە**

**لە شیر گرتنەوە:** شیر ڤەکرن؛ لە شیر برینەوە؛ لە مەمکە برینەوە؛ منال لە شیر گرتنەوە؛ ئیتر شیر پیٚنەدان ⇐ از شیر بازگرفتن بچه

**شیرا / şîra/:** ☜ **شیردەر**

**شیرار / şîrar/:** ناو. برای مێرد؛ شووبرا ⇐ برادرشوهر

**شیراز / şîraz/:** ناو. ١. دارێکە لە دار بەلالووک دەچیٚ ٢. سیراج؛ شیرێژ ٣. ☜ **شیرازە** ⇐ ١. درختی شبیه درخت آلبالو ٢. شیراز؛ دوغ چکیده ٣. ☜ **شیرازە**

**شیرازە / şîraze/:** ناو. شیراز؛ شێرازی: ١. تابەن؛ شلاڵە؛ برۆش؛ دروومانی لاپەڕەی کتێب یان دەفتەر ٢. ڕێزەتەقەڵی پەراوێزی لیباس ⇐ ١. شیرازەی کتاب و دفتر ٢. سجاف لباس

▣ **شیرازەی شتێ بڕیان:** *[کنایە]* لێک‌هەڵوەشان و تیا چوون ⇐ از هم گسیختن و نابود شدن

**شیرازەی کەسێ بڕیان:** *[کنایە]* پیر بوون و هیچ لیٚ نەمان ⇐ پیر و از کار افتاده شدن

**شیرازەبەن / şîrazeben/:** ئاوەڵناو. شیرازەبەند: ١. بەن‌درواو ٢. پەراوێزلێ‌نراو ⇐ ١. شیرازەشده ٢. صحافی‌شده

**شیرازەبەند / şîrazebend/:** ☜ **شیرازەبەن**

**شیرازەچن / şîrazeçin/:** ناو. تابەن: ١. شیرازە؛ شلاڵە؛ برۆش؛ شیراز؛ دروومانی لاپەڕەی کتێب یان دەفتەر ٢. کەسێ کاری دروومانی لاپەڕەی کتێبانە. هەروەها: **شیرازەچنی** ⇐ ١. شیرازە ٢. صحاف

**شیرازی / şîrazî/:** ناو. ١. جۆرێ ترێ ٢. جۆرێ تووی سپی زۆر شیرین ⇐ ١. نوعی انگور ٢. نوعی توت سفید

**شیرامە / şîrame/:** ناو. گیایەکە لە ناو دەخڵ دەڕوێ و لە چۆدان دەچیٚ ⇐ گیاهی است

**شیرانە / şîrane/:** ☜ **شیربایی**

**شیرانی / şîranî/:** ☜ **شیرینی**

**شیراوشیر / şîrawşîr/:** ناو. شیربەشیر؛ زاینی ژن ساڵیٚ جاریٚ پێش لە شیر برانەوەی منداڵی پێشوو ⇐ زایمان سالی یک بار

▣ **شیراوشیر بوون:** شیربەشیر بوون؛ سکوزا کردنی لە سەر یەک و پێش لە شیر برانەوەی منداڵی پێشوو ⇐ شیر به شیر آوردن

**شیراوی / şîrawî/:** ئاوەڵناو. تێکەڵ بە شیر ⇐ شیری

**شیربا / şîrba/:** ☜ **شیربایی**

**شیربایی / şîrbayî/:** ناو. *[دابی کۆن]* شیرانە؛ شیربا؛ شیربەها؛ شیروا؛ شیروایی؛ قەڵەن؛ قەڵەند؛ قەڕەن؛ قالان؛ کەلەن؛ نەخت؛ پارە یان ماڵیٚ کە زاوا (یان بنەماڵەکەی) پێش زەماوەن دەبوو بە باوک (یان بنەماڵە)ی بووکیان بدایە ⇐ شیربها

**شیربرا / şîrb(i)ra/:** ناو. برای شیری؛ کوڕیٚ کە لە مەمکی دایکی، کچیٚ یان کوڕیٚ شیری خواردوە و ئەم بۆتە برای ⇐ برادر شیری

**شیربرنج / şîrb(i)rinc/:** ناو. شوتین؛ شیرەوا؛ چێشتی برنج و شیر ⇐ شیربرنج

**شیربرێش / şîrb(i)řêş/:** ناو. چێشتی شیر و برۆێش ⇐ سوپ شیر و بلغور

**شیربەشیر / şîrbeşîr/:** ☜ **شیراوشیر**

▣ **شیربەشیر بوون:** ☜ **شیراوشیر بوون**

**شیربەها / şîrbeha/:** ☜ **شیربایی**

**شیرپارزۆنگ / şîrparzong/:** ☜ **شیرپاڵێو**

**شیرپارزینگ / şîrparzîng/:** ☜ **شیرپاڵێو**

**شیرپاک / şîrpak/:** ئاوەڵناو. *[کنایە]* چاک و پاک و

بێ‌گزی. هەروەها: **شیرپاکی** ≡ درستکار

**شیرپاڵۆ** / şîrpało/: ☜ **شیرپاڵێو**

**شیرپاڵۆک** / şîrpałok/: ناو. ١. ☜ **شیرپاڵێو** ٢. کونێ لە قەدی دۆلاشەوە بۆ خاوێن کردنەوە ≡ ١. ☜ **شیرپاڵێو** ٢. سوراخی در ناو آسیا برای تمیز کردن

**شیرپاڵێو** / şîrpałêw/: ناو. شیرپارزۆنگ؛ شیرپارزینگ؛ شیرپاڵۆ؛ شیرپاڵۆک؛ شیرپاڵێوک ≡ شیرپالا

**شیرپاڵێوک** / şîrpałêwik/: ☜ **شیرپاڵێو**

**شیرتین** / şîrtîn/: ☜ **شیلەوگەرم**

**شیرتیەن** / şîrt(i)yen/: ئاوەڵناو. شلەتێن؛ شلەتین؛ شیرتین ≡ ولرم

**شیرتێن** / şîrtên/: ☜ **شیلەوگەرم**

**شیرحوشتر** / şîrĥuştir/: ناو. حوشترخۆرکە؛ دڕکێکە حوشتر حەزی لێ دەکا ≡ خارشُتُر

**شیرحەرام** / şîrĥeram/: ناو. عاق؛ ئەوی بێ‌فەرمانی دایک و بابی دەکا و بەر تووک و نفرینیان دەکەوێ ≡ عاق

**شیرخشت** / şîrxişt/: ناو. گزگەتوولین؛ تووڵەگزی: ١. پنچکەگیایەک لە تیرەی گوڵەسووره ٢. ماکێکی شەکراوی کە لەم گیایەدا دەچۆڕێ و بۆ ڕەوان کردنی سک باشە ≡ ١و٢. شیرخشت

**شیرخوژیلک** / şîrxujîlik/: ناو. شیرخوشیلک؛ شیری گیای خوشیلکە، بۆ ڕەوانی دەبێ ≡ شیرەی گیاهی کە مُسهل است

**شیرخوشک** / şîrxuşk/: ناو. ١. دوو کچ یان کچ و کوڕێ پێکەوە شیری دایکێکیان خواردبێ ٢. ☜ **شیروشک** ≡ ١. خواهر شیری ٢. ☜ **شیروشك**

**شیرخوشیلک** / şîrxuşîlik/: ☜ **شیرخوژیلك**

**شیرخۆر** / şîrxor/: ☜ **شیرەخۆرە**

**شیرخۆرە** / şîrxore/: ناو. شیرمژ؛ بەرمەمکان ≡ شیرخوارە

**شیرخەس** / şîrxes/: ناو. حەیوانێ کە بە ساوایی ئێختە بکرێ ≡ حیوانی کە در شیرخوارگی اختە شود

**شیردار** / şîrdar/: ☜ **شیردەر**

**شیردان** / şîrdan/: ناو. ١. شیلاو؛ شیلاڤک؛ شیلافە ٢. تۆنگی بچووکی جێ شیر ≡ ١. شیردان حیوان ٢. شیرریز

**شیردۆش** / şîrdoş/: ناو. ١. بێریڤان؛ کەسێ کە دۆشینی پێ سپێراوە ٢. ئامرازی شیر دۆشین ≡ ١و٢. شیردوش

**شیردەر** / şîrder/: ئاوەڵناو. شیرا؛ شیردار؛ شیری؛ بەشیر؛ توانا بۆ بەرهەم هێنانی شیر ≡ شیردە

**شیرڕێژ** / şîr̄êj/: ناو. بنچلەکەشیر؛ گیایەکە لە تیرەی خاچییەکان، باڵای نزمە، بەرێکی خڕی لینج دەگرێ، بۆ نەرم کردنی سینگ و ڕیخۆڵە کەڵکی لێ وەردەگرن ≡ کیسە چوپان

**شیرسووتو** / sirsûtû/: ئاوەڵناو. شیرمردە؛ تایبەتمەندی منالێ کە لە بەر بێ‌شیری گەورە نەبووبێ ≡ شیرسوز

**شیرشیرۆکە** / şîrşîroke/: ناو. گیای خوژیلک ≡ گیاهی شیردار

**شیرفرۆش** / şîrf(i)roş/: ئاوەڵناو. فرۆشەری شیر. هەروەها: **شیرفرۆشی** ≡ شیرفروش

**شیرک** / şîrik/: ناو. شیلەی گیا ≡ شیرەی گیاه

**شیرکاکاهو** / şîrkakahû/: ناو. تێکەڵاوی شیر و شەکر و کاکاهوو بۆ خواردنەوە ≡ شیرکاکائو

**شیرکتک** / şîrk(i)tik/: ئاوەڵناو. *[پلار]* زۆر بە هەرا و هوریا ≡ پُر سروصدا

**شیرکوت** / şîrkut/: ناو. دەخڵی فەریکەی کوتراو ≡ غلەی نارسیدەی کوبیدە

**شیرکوڕۆژ** / şîrkuroj/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ئازا لە شەڕ ≡ جنگاور

**شیرکول** / şîrkul/: ناو. داری چوارگۆشەی ژێر

کۆلەکە ☜ چوب چهارگوش زیر ستون

**شیرکەت** / şîrket/: ناو. بەشدارگە؛ هاوبەشگە؛ شەریکە ☜ شرکت

**شیرکی**[1] / şîrkî/: ناو. شیری؛ ڕەنگی سپی شیری ☜ رنگ شیری

**شیرکی**[2]: ئاوەڵناو. شیری؛ بە ڕەنگی شیر ☜ شیری رنگ

**شیرگرسێن** / şîrgirsên/: ناو. ڕۆنیاسەگیا؛ سۆتیچکە؛ کەولەگیا ☜ شیرپنیر

**شیرگورگە** / şîrgurge/: ناو. ئەستوونی ئامانەتی بۆ ڕاگرتنی کاریتە و... ☜ ستون‌های موقتی در بنا

**شیرگەر** / şîrger/: ناو. شووگەر؛ وەستای شیر و خەنجەر ☜ سازندەی شمشیر و خنجر

**شیرمار** / şîrmar/: ☜ **شیرهەلەز**

**شیرمارەکێویلە** / şîrmarekêwîle/: ناو. جۆرێک لە شیرمار بە گوڵی شین و بچووکەوە، قەدەکەی ژەهراوییە ☜ شبرم

**شیرماسی** / şîrmasî/: ناو. شمشێرماسی؛ کلکەموو؛ جۆرێک ماسی بە قەپۆزێکی درێژی شیرئاساوە کە لە ئێسقانەکانی شەویلاکی سەرووی پێکهاتووە ☜ شمشیرماهی

**شیرمایی** / şîrmayî/: ناو. عاج؛ خێل ☜ عاج

**شیرمردە** / şîrmirde/: ☜ **شیرسوتو**

**شیرمژ** / şîrmij/: ☜ **شیرخۆرە**

**شیرمل** / şîrmil/: ناو. گیایەکی شیرە دارە ☜ گیاهی شیردار

**شیرمەست** / şîrmest/: ئاوەڵناو. تێر شیر خواردووی و مر بوو ☜ سیر شده از شیر

**شیرمەشک** / şîrmeşk/: ناو. خیگەی خۆشکراوی شیر تێ کردن ☜ مشک شیر

**شیرمەلیچک** / şîrmelîçik/: ☜ **شیری چۆلەکە**

**شیرن** / şîrin/: ☜ **شیرین**

**شیرناتی** / şîrnatî/: ناو. هەموو جۆرە چەرەی چێکراو لە شەکر و ... ☜ شیرینیجات

**شیرنچک** / şîrinçik/: ☜ **شیرینچك**

**شیرنکاری** / şîrinkarî/: ناو. دەستڕەنگینی؛ کارێکی سەرنجڕاکێش، دلگر یان سەرسووڕێنەر. هەروەها: **شیرنکار** ☜ شیرینکاری

**شیرنگروێ** / siringiřwê/: ئاوەڵناو. خاوەن دەم و چاوی کەم تا زۆر گروێ ☜ آبلەرو

**شیرنی** / şîrnî/: ☜ **شیرینی**

**شیرنیات** / şîrn(i)yat/: ناو. شەکرۆک؛ شەکەرات؛ نوقل ☜ آبنبات

**شیرنیخۆران** / şîrnîxoran/: ☜ **شیرینیخۆران**

**شیروا** / şîrwa/: ☜ **شیربایی**

**شیروارە** / şîrware/: ناو. دەستەوامی شیر؛ کاری شیر بە یەکتر قەرز دان ☜ عمل قرض دادن شیر به یکدیگر

**شیروانی** / şîrwanî/: ناو. شێروانی؛ جۆرێک میچی لێژ، زۆرتر بە پەڕەی ناسکی کانزایی ☜ شیروانی

**شیروایی** / şîrwayî/: ☜ **شیربایی**

**شیروایی‌وڕ** / şîrwayîwiř/: ناو. *[دابی کۆن]* کاری دیاری کردنی شیربایی کچێک. هەروەها: **شیروایی‌وڕ کردن** ☜ تعیین شیربها

**شیروبرنج** / şîr û b(i)rinc/: ناو. گرنج‌بەشیر؛ برنج بەشیر ☜ شیربرنج

**شیروشک** / şîrwişk/: ناو. شیرخوشک؛ شیرێ کە ئاوەکەیان گرتووە و بە شێوەی گەرد دەرهاتووە، تا ناردە بکرێ و بۆ ماوەیەکی درێژ بمێنێتەوە ☜ شیرخُشک

**شیروشەپاڵ** / şîr û şepał/: ناو. بەیبوون؛ بابوونە ☜ بابونە

**شیروکوت** / şîr û kut/: ☜ **شەت‌وکوت ـ٢**

**شیروەشێن** / şîrweşên/: ئاوەڵناو. کارا لە شەڕەشمشێردا ☜ شمشیرزن

**شیرە**[1] / şîre/: ناو. ١. تراوێ کە لە نێو ساقەتەی

ڕوەکدا لـە گەڕدایـە ۲. ڕۆن‌گەرچـەک ۳. ئـاوی کولاوی میوەی شیرین ٤. ماکێکی سـڕکەرە، لـە کولاندنی سووتکەتریاک دروسـت دەکـرێ ▤ ۱. شیرابه؛ شیرەی درخت یا گیاه ۲. روغـن کرچـک ۳. شیره ۴. شیرەی تریاک

⊡ **شیره تێپەڕین**: زەرد بـوونی ڕوەک (بەتایبـەت گەنم و جۆ) ▤ زرد شدن گیاه (بویژه گندم و جو)

**شیره**[۲]: ☜ **شیری**[۲]**ـ۲**

**شیرەبەڕوو** / şîrebeřû/: نـاو. لکی تازەی دار بەڕوو ▤ جوانەی درخت بلوط

**شیرەبەلال** / şîrebelal/: ناو. گەنمەشامی تەڕچک و شیرەدار ▤ شیربلال

**شیرەپە** / şîrepe/: ناو. شیلەپە: ۱. ئامرازێکـە لـە نیر و ئامووردا ۲. داروو‌کەیەکـە لـە عەڕەبانـەی گیاکێشاندا ▤ ۱. ابـزاری در خـیش ۲. چـوبکی در گاری گیاهکشی

**شیرەت** / şîret/: ناو. تەگبیر؛ ڕاوێژ ▤ مشورت

**شیرەخانە** / şîrexane/: نـاو. شـوێنی تلیـاک کێشان ▤ شیرەکش‌خانه

**شیرەخوەر(ە)** / şîrex(i)wer(e)/: ☜ **شیرەخۆرە**

**شیرەخۆرە** / şîrexore/: ئاوەڵـناو. شـیرەخوەر(ە)؛ شیرخۆر؛ شیرمژ؛ بەرمەمکان؛ بە تەمەنی کەمتر لە دوو ساڵان ▤ شیرخواره

**شیرەخۆری** / şîrexorî/: ناو. ماوەیـەک لـە ژیـانی گیانداری گواندار، لە کاتی هاتنـە دنیـاوە تـا لـە شیر بڕانەوە ▤ شیرخوارگی

**شیرەدارینە** / şîredarîne/: ناو. ۱. شمشێر لـە دار بـۆ مـەلای خوتبـەخوێن ۲. *[پلار]* ترسـەنۆکی بافیشکەر ▤ ۱. شمشیر چوبین ۲. ترسوی لافزن

**شیرەدان** / şîredan/: ناو. دەفری ڕۆن‌گەرچەک ▤ ظرف روغن‌کرچک

**شیرەشوانە** / şîreş(i)wane/: نـاو. ۱. شیرێک کـە بە دەست تێوەردانی گوان تـزەی تـێ دەکـا ۲. *[کینایه]* ڕوحمی پاش دووری و لە بـیر چـوون ▤ ۱. شیری که در اثر مالش پستان ترشح مـی‌شـود ۲. محبت بعد از دوری و فراموشی

**شیرەقوڵە** / şîrequłe/: نـاو. خۆراکێکـە زۆرتـر شوانان بەرهەمی دێنن، بەم شێوە کە بـەردێکی خاوێنی لە ناو کوانوو داخ هەڵگەڕاو دەنێنـە نێـو مەنجەڵێکی شیر و لێدەگەڕێن تا دێتـە کـوڵ و خەسـت دەبێتـەوە، ئـەوجار بـە سـەری نانیـدا دەسـاون و شـەکری پێـدا دەپـژێنن و لـوولی دەدەن ▤ خوراکی چوپانی

**شیرەگەرم** / şîregerm/: ئاوەڵـناو. شـلـەتێن؛ شلەتین ▤ ولرم

**شیرەمار** / şîremar/: نـاو. ئالقـەتیز؛ گیایەکـە شیرەکەی زۆر ڕەوانە ▤ گیاهی با شیرەی مُسهل

**شیرەماڵ** / şîremał/: ناو. لەپماڵ؛ خاکەڕۆ؛ کـاری بن خەرمان بە دەست کۆ کردنەوە ▤ عمل جمع کردن ته خرمن با دست

**شیرەمەنی** / şîremenî/: نـاو. (!) سـپیاتی؛ شـیر و خۆراکی بەرهـەمهـاتوو لـە شـیر (وەک ماست، پەنیر، کەرە و ...) ▤ لبنیات

**شیرەوا** / şîrewa/: ☜ **شیربرنج**

**شیرەوتین** / şîrewtîn/: ☜ **شیلەوگەرم**

**شیرهەلەز** / şîrhelez/: نـاو. شـیرمار؛ خوشـیلک؛ خورایلـک؛ تالیشـک؛ ڕوەکێکـە بـە گـەڵای ئەستوورەوە کە شـیرەیەکی ژاراوی هەیـە و بـۆ دەرمان دەشێ ▤ شیرگیاه

**شیری**[۱] / şîrî/: نـاو. ۱. ڕەنگـی شـیری؛ سـپی تۆزکاڵێ زەرد ۲. *[مەجاز]* منداڵی ‹خوویێ بگـری بە شیرێ بەری نادەی بە پیری «مەسـەل»› ▤ ۱. رنگ شیری ۲. کودکی

**شیری**[۲]: ئاوەڵـناو. ۱. بـە ڕەنگـی شـیر ۲. شـیرە؛ پێوەندیـدار بـە کـاتی شـیرەخۆرییەوە ‹ددانی شیری› ۳. هاوشیر؛ تایبەتمەندی کوڕ و کچی لە

شیری یەک کەس خواردوو ٤. پێوەندیدار یان سەر بە شیر ‹ماکی شیری› ٥. شیراوی؛ تێکەڵ بە شیر ‹شوکلاتی شیری› ▬ ١و٢. شیری ٣. رضاعی ۴و۵. شیری

**شیرین** / şîrîn/: ئاوەڵناو. شرین؛ شیرن: ١. بە تامی شەکرەوە ٢. *[مەجاز]* خۆش؛ دڵگر ‹شێوەی شیرین؛ خەوی شیرین› ٣. جوان و پێکەوتوو ‹قیافەی شیرین› ▬ ١. شیرین ٢. دلنشین ٣. زیبا و دلربا

**شیرین‌بەلەک** / şîrînbelek/: ناو. شیرین‌بەیان؛ مێلوک؛ بەلەک؛ بەلیەک؛ هەکوک؛ مەکیک؛ مەکووک؛ مێکووک؛ مێکووکە؛ میمووک؛ مەلیم؛ مەلێم؛ ڕووەکێکی قنجی کێوی پایا لە تیرەی نۆکان، بە بەرزایی میتر و نیویک، قەد و گەڵای شیلاوی، گوڵی سپی، بنەوش یان مەیلەو شیری، بە ڕیشەی درێژ و شیرینەوە کە بۆ دەرمان و دروستکردنی کۆلاش کەڵکی لێ وەردەگرن ▬ شیرین‌بیان

**شیرین‌بەیان** / şîrînbeyan/: ☜ **شیرین‌بەلەک**

**شیرین‌پلاو** / şîrînp(i)ław/: ناو. پلاوی بە شەربەت و گولاو لێنراو ▬ شیرین‌پلو

**شیرین‌تو** / şîrîntû/: ناو. گوڵەشەراوی؛ گوڵی ساعەتی ▬ گُل ساعتی

**شیرین‌تەرز** / şîrînterz/: ئاوەڵناو. ڕواڵەت‌جوان ‹شێوەی شیرین‌تەرز شۆخی خەرامان/ مەدیا بە لاوە ماچی لەیل ئامان «خانای قوبادی»› ▬ خوش‌سیما؛ خوش‌نمود

**شیرینجق** / şîrînciq/: ☜ **شیرینچك**

**شیرینجک** / şîrîncik/: ☜ **شیرینچك**

**شیرینچک** / şîrînçik/: ئاوەڵناو. شیرنچک؛ شیرینجک؛ شیرینجق؛ شیرنی لیچق ▬ شیرین‌مزەی لزج

**شیرینخوێ** / şîrînx(i)wê/: ئاوەڵناو. کەم‌خوێ ▬ کم‌نمک

**شیرین‌خەو** / şîrînxew/: ناو. خەوی قووڵ و خۆش ‹چاوم لە شیرین‌خەودا بوو بوومەلەرزەکە هات› ▬ خواب‌عمیق

**شیرین‌خێل** / şîrînxêl/: ئاوەڵناو. نەختێ چاوخێل، کە لێ جوانە ▬ لوچ زیبا

**شیرین‌زمان** / şîrînz(i)man/: ئاوەڵناو. شیرین‌زوان قسەخۆش؛ دەم‌نەرم ▬ شیرین‌زبان

**شیرین‌زوان** / şîrînz(i)wan/: ☜ **شیرین‌زمان**

**شیرین‌شاتەڕە** / şîrînşateře/: ناو. ١. خاکشیر دەیمی؛ کونجی دەیمی؛ ڕووەکێکی خۆڕسکە، لە دەشت و نێو باخ و بناری کێودا دەڕوێ و تا ٨٠ سانتی‌میتر بالا دەکا، لقەکانی باریک و گەڵاکانی درێژ و گوڵەکانی بچووکی زەردن، کلووی بەرەکەی پانزدە تا سی سانتی‌میتر دەبێ دەنکەکانی لە دەنکی خاشخاش دەکا و تاڵە ٢. *[پلار]* مرۆڤی بە ڕواڵەت جوانی هیچ و پووچ ▬ ١. خاکشیر طبی ٢. آدم خوش‌ظاهر بی‌وجود

**شیرین‌شاهۆ** / şîrînşaho/: ناو. واق؛ شینەشاهۆ ▬ بوتیمار

**شیرین‌شۆک** / şîrînşok/: ناو. گیایەکی کوێستانی گەلاپانە، گوڵی سووری جوان دەردەکا، سەلکەکەی وەک پیاز وایە و شیرینە ▬ گیاهی است

**شیرین‌شەل** / şîrînşel/: ئاوەڵناو. نەختێک شەل، کە لێ جوانە ▬ اندکی لنگ

**شیرین‌شێوە** / şîrînşêwe/: ئاوەڵناو. لەبار؛ پێکەوتوو ▬ برازنده

**شیرینکار** / şîrînkar/: ئاوەڵناو. کارجوان؛ پێکەوتوو. هەروەها: **شیرینکاری** ▬ شیرینکار

**شیرین‌گرۆێ** / şîrîngiřwê/: ئاوەڵناو. گرۆێی خوێن‌شیرین ▬ أبله‌روی نمکین

**شیرین‌وتاڵ** / şîrîn û tał/: ناو. تریٚ‌مارانە؛

ڕەزڕەزۆک؛ قەبقەبۆک ☰ تاجریزی

**شیرینه** / şîrîne/: ناو. گەزووی؛ گەزۆ ☰ گزانگبین

**شیرینەکڕ** / şîrînekiř/: ناو. ڕەوتی کڕ کەوتنی کەو، چەن ڕۆژ پێش هەڵێنانی هێلکەکانی، کە هەڵنافڕێ ☰ فرایند خوابیدن کبک روی تخم‌هایش، چند روز قبل از درآمدن جوجه‌ها

**شیرینی** / şîrînî/: ناو. شیرانی؛ شیرنی: ١. یەکێک لە چوار چێژی سەرەکی کە بە بەشی پێشەوەی زمان هەست دەکرێ (وەک چێژی شەکر و هەنگوین) ٢. دۆخ یان چۆنیەتی شیرین بوون ‹بزانە شیرینییەکەی باشە؟› ٣. چەرەی چێ‌کراو لە ماکی شەکری، بەتایبەت ئەوەی لە ئارد، شەکر، ڕۆن یان کەرەیە ٤. ئەوەی (لە دیاری و خواردەمەنی) بە بۆنەی بەڕێوە چوونی کارێک یان ڕووداوێکی خۆشەوە بە خزم و دۆستانی دەدەن ‹کەی شیرینی ماڵ سەندنەکەت دەدەی؟› ☰ ١تا٤. شیرینی

⊡ **شیرینی کەسێک خواردن:** /کنایە/ کۆ بوونەوە، شایی کردن و خواردنی شیرینی بە بۆنەی ڕوودانی ڕووداوێکی پیرۆز لە ژیانی کەسێکدا ☰ شیرینی کسی را خوردن

**شیرینی‌پەز** / şîrînîpez/: ناو. شیرینی‌پێژ؛ قەناد؛ کەسێ کە کاری دروست کردنی شیرینییە. هەروەها: **شیرینی‌پەزی** ☰ شیرینی‌پز

**شیرینی‌پێژ** / şîrînîpêj/: ☜ **قەناد**

**شیرینی‌خانە** / şîrînîxane/: ناو. قەنادی؛ کارگە و فرۆشگای شیرینی ☰ قنادی

**شیرینی‌خوەران** / şîrînîx(i)weran/: ☜ **شیرینی‌خۆران**

**شیرینی‌خۆران** / şîrînîxoran/: ناو. شیرینی‌خوەران؛ شیرنی‌خۆران؛ زەماخوا؛ دەس‌ماچ کردن؛ ڕێوڕەسمێ کە دوای وەڵامی خوازبێنی و بەر لە مارە بڕین بەڕێوە دەچێ و زاوا بۆ ماڵی هاوسەری داهاتووی شیرینی دەنێرێ و لەوێدا جەژنێک ڕێک‌دەخەن ☰ شیرینی‌خوران

**شیرینی‌فرۆشی** / şîrînîf(i)roşî/: ناو. قەنادی: ١. کار و باری شیرینی فرۆشتن ٢. دووکانی قەنادی؛ دووکانی شیرینی‌فرۆشی ☰ ١و٢. شیرینی‌فروشی

**شیرێژ** / şîrêj/: ناو. سیراج؛ ژاژی؛ شیراز ☰ شیراز؛ دوغ چکیده

**شیڕ**[1] / şîř/: ناو. /ناشیرین/ ١. وشەی تیز پێ‌کردن ٢. جرت؛ زرت ٣. قیرە و هەرا ☰ ١. کلمەی استهزا ٢. شیشکی ٣. دادوقال

⊡ **شیڕ داهێشتن:** شیڕ لێ‌دان؛ جرت لێ دان؛ دەنگی شیڕ بە دەم دەرهێنان ☰ شیشکی بستن

**شیڕ**[2]: دەنگ. دەنگی وەک دادڕانی پارچە ☰ صدای جرخوردن پارچە

**شیڕ**[3]: سارسته. /ناشیرین/ فچ؛ ئەی نا ☰ زکی

**شیڕان** / şîřan/: چاوگ. /ناشیرین/ ١. گوڕین؛ نەڕە کردن ٢. /کنایە/ گووی شل هەڵڕژتن ☰ ١. غُریدن ٢. ریدن اسهالی

**شیڕاندن** / şîřandin/: چاوگ. تێنەپەر. //شیڕاندت؛ دەشیڕێنی؛ بشیڕێنە// /ناشیرین/ شیڕانن: ١. نەڕاندن؛ گوڕاندن ٢. گووی شل هەڵڕژتن ☰ ١. غُریدن ٢. اسهالی ریدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەشیڕاندن

**شیڕشیڕە** / şîřeşîř/: ناو. زیڕزیڕە؛ جرجرە؛ زیڕزیڕەک؛ جیرجیرەک؛ بەرزەچڕ؛ مەل‌زیڕنەک؛ مێروویەکی پچووکی وەک کوللەیە، جیڕەجیڕ دەکا ☰ جیرجیرک

**شیڕە** / şîře/: ناو. نەڕە؛ دەنگی بەرزی بە تووڕەیی ☰ غریو

**شیڕەت** / şîřet/: ئاوەڵناو. /پلار/ ١. تووش و

شـەڕانی ٢. هاروهـاج و دەنـگدەرهـاتوو 🇮🇷 ١. شرور و ستیزەجو ٢. سرکش و غُرغُرو

**شیرەشیر** / şîreşîr /: دەنگەناو. [پلار] قیرەقیـڕ؛ داد و هاوار ‹بوو بـە چەقەقـە و شیرەشـیرێک دەتگـوت کاسـەی قـەرەچی ئـاو بردوویـە! «هـەژار، چێشـتی مجێور»› 🇮🇷 داد و قال

**شیرێز** / şîrêz/: نـاو. سرێش؛ چـرێش؛ ئەسـریلک 🇮🇷 سریش

**شیش** / şîş/: ناو. ١. سێخ؛ پارچە ئاسنی درێژووکە بـۆ گۆشـت برژانـدن ٢. شـاخ؛ تیشەشـاخ ٣. گەنمەکوتاو ٤. [منداڵانە] شش؛ کـاری شـاردنەوە 🇮🇷 ١. سیخ ٢. صـخره ٣. گنـدم نیمکـوب ۴. عمـل پنهان کردن در زبان بچەها

**شیشـار** / şîşar/: نـاو. سـی؛ جـەرگی سـپی؛ سیپەلاک 🇮🇷 ریه؛ شُش

**شیشان**[١] / şîşan/: چاوگ. شیشیان ↓

▣ **شیشـانە یـەکتر**: پێـکهەڵـپڕژان؛ تێـک هەڵچڕژان ‹من جنێو بە ئەو، ئەو بە مـن جنێـو/ شیشاینە یەکتر هەر وەک جن و دێو «قـانع»› 🇮🇷 با هم درگیر شدن

**شیشان**[٢]: ناو. گیایەکە 🇮🇷 گیاهی است

**شیشک** / şîşik/: نـاو. بنـەڕەت؛ خـیم؛ بنـەما 🇮🇷 بُنیان؛ شالودە

**شیشکـراو** / şîşk(i)raw/: ئاوەڵـناو. شـاردراوە؛ شێردراوە 🇮🇷 پنهان

**شیشکوت** / şîşkut/: ناو. پشکێنەری بار بە شـیش 🇮🇷 مُفتش بار

**شیشکۆ** / şîşko/: ئاوەڵـناو. قەڵەو؛ چاخ؛ گۆشتن 🇮🇷 چاق و چله

**شیشلۆق** / şîşloq/: ئاوەڵـناو. زلکـوێر؛ چـاوزاق 🇮🇷 چشمبرجستەی کمبینا

**شیشمان** / şîşman/: ئاوەڵناو. زۆر قەڵـەو 🇮🇷 بسـیار چاق

**شیشمەلۆ** / şîşmeło/: نـاو. ئاسنی سەر خـوار بـە دەسکی دارەوە بـۆ مەڵـۆ لـە عـەرز گوازتنـەوە، نەوەک ماری لە بندا بـێ 🇮🇷 ابـزاری در برداشـتن علف درویده

**شیشنگ** / şîşing/: نـاو. لای سەرووی لاجانـگ 🇮🇷 گیجگاه

**شیشۆقە** / şîşoqe/: نـاو. قاشوولە؛ وردە شووشـە و سواڵەتی ڕەنگدار، منداڵ گاڵتەی پێ دەکـەن 🇮🇷 شکستەهای شیشە و کاشی

**شیشۆڵ** / şîşoł/: ناو. سمۆرە 🇮🇷 سنجاب

**شیشـە** / şîşe/: نـاو. ١. ☜ **شووشـە** ٢. سـێخ؛ شیشی گۆشـت ٣. مـاکێنی خاوکـەرەوەی زۆر بەهێز و چەتوونە 🇮🇷 ١. ☜ **شووشە** ٢. سـیخ ٣. مادەی مُخدر شیشە

**شیشەبڕ** / şîşebiř/: ناو. جامچی 🇮🇷 شیشەبر

**شیشـەبەند**[١] / şîşebend/: نـاو. نـەردە؛ نـەردێ 🇮🇷 نردە

**شیشەبەند**[٢]: ئاوەڵناو. مینابەند؛ شیشـەکاریکـراو؛ بە شیشـە داپۆشـراو. هـەروەها: **شیشـەبەندی** 🇮🇷 شیشەکاری شُدە

**شیشەچرا** / şîşeç(i)ra/: نـاو. مـالچرا؛ گرداپۆشـی چرا 🇮🇷 شیشەی چراغ

**شیشەخۆر** / şîşexor/: ☜ **شووشەخۆر**

**شیشەسازی** / şîşesazî/: ☜ **شووشەسازی**

**شیشەسۆڵ** / şîşesoł/: ☜ **شیشەسەهۆڵ**

**شیشـەسـەهـۆڵ** / şîşesehoł/: نـاو. شیشەسـۆڵ؛ گەزووز؛ زەمبەلیلک؛ چلوورە 🇮🇷 دنگالە

**شیشەشـیر** / şîşeşîr/: نـاو. بوتڵـی سـەر بـە مەمڵـەمژە، بـۆ شـیر خـواردنی زارۆکـان 🇮🇷 شیشەشیر

**شیشەک** / şîşek/: ☜ **شەك ـ١**

**شیشەگەر** / şîşeger/: ☜ **شووشەگەر**

**شیشەوڕ** / şîşewiř/: ☜ **شووشەبڕ**

**شیشەیی** / şîşeyî/: ناو. ١. ☜ **شووشەیی** ٢. ئالوودەی ماکی سڕکەری شیشە ⊡ ١. ☜ **شووشەیی** ٢. مُعتاد به شیشه

**شیشیان** / şîşyan/: ☜ **شیشان**[1]

**شیشێ** / şîşê/: ☜ **شووشە**

**شیعر** / şî'r/: ناو. شێعر؛ شەعر: ١. هۆنە؛ هۆنراوە؛ هەڵبەست؛ هلبەست؛ هەڵوەس؛ نەوشە؛ وتەیێ کە کێش، بەشاوەند و واتای هەیە ٢. وتەی کێشدار ٣. بەرهەمی ئەزموون، بینین، هەست و داهێنانی هونەری شاعیر ⊡ ١تا٣. شعر

⊡ **شیعری ئازاد**: شیعری نوێ؛ هەڵبەستێ کە دەروەسی ئاهەنگ، کێش و بەشاوەند نییە ⊡ شعر نو

**شیعری بڕگەیی**: شیعرێ کە بنەمای کێشەکەی، ژمارەی بڕگەی باڵەکانییە، وەک شیعری فولکلۆری کوردی کە بیست بڕگەی چواربەشییە ⊡ شعر هجایی

**شیعری سپی**: جۆرێک شیعری ئازاد (لە ویژەی ئوورووپادا) کە زۆرتر پێنج بڕگەیی و بێبەشاوەندە ⊡ شعر سپید

**شیعری عەرووزی**: شیعرێ کە سەرانسەری کێشێکی دیاریکراو ( بەحر)ی هەیە ⊡ شعر عروضی

**شیعری نوێ**: ☜ **شیعری ئازاد**

**شیعری** / şî'rî/: ئاوەڵناو. هۆنراوەیی؛ پێوەندیدار لەگەڵ شیعر یان سەر بە شیعر ⊡ شعری

**شیعە**[1] / şî'e/: ناو. شێعە؛ هەرکام لەو ڕێبازانەی کە جێگرەتی پێغەمبەری ئیسلام بە مافی ئامۆزاکەی، واتا عەلی کوڕی ئەبیتالب دەزانن ⊡ شیعه

**شیعە**[2]: ئاوەڵناو. شێعە؛ شوێنکەوتووی ڕێبازی تەشەییوع ⊡ شیعه

**شیف** / şîf/: ناو. شوول؛ توول؛ شوو ⊡ ترکه

**شیفت** / şîft/: ناو. نۆرەکار؛ دەسە ‹شیفتی بەیانی؛ شیفتی شەو›. هەروەها: **شیفتی** ⊡ شیفت

**شیڤ** / şîv/: ناو. ١. تاریکایی سەری شەو ٢. نانی شەو ٣. دۆڵ؛ گەڵی؛ ناوچیا ٤. چرۆ؛ بشکوژ؛ گوڵی دار ⊡ ١. هنگام شام ٢. شام ٣. درّه ۴. شکوفه

⊡ **شیڤ خارن**: ☜ **شام خواردن**

**شیڤ کرن**: ☜ **شام خواردن**

**شیڤئەینی** / şîv'eynî/: ناو. شەو جمعانە ⊡ صدقەی مُرده در شب جمعه

**شیڤان** / şîvan/: ☜ **شوان**

**شیڤدەست** / şîvdest/: ناو. دەسکە داوی کەو گرتن ⊡ نوعی دام شکار کبک

**شیڤک** / şîvik/: ☜ **شیوەڵە**

**شیڤمری** / şîvm(i)rî/: ناو. چێشت بە خێری مردوو ⊡ غذای صدقەی مرده

**شیڤەلۆک** / şîvelok/: ☜ **شیوەڵە**

**شیق**[1] / şîq/: ناو. درز؛ قەڵشت ⊡ تَرَک

⊡ **شیق بردن**: شەق بردن؛ درز دان ⊡ شکاف برداشتن

**شیق**[2]: دەنگەناو. ١. دەنگی لێدانی قامچی ٢. زیقە؛ قیژە ⊡ ١. صدای زدن شلاق ٢. جیغ

**شیقال** / şîqal/: ناو. ١. تیتاڵ؛ تیتۆڵ؛ بزگوڕ ٢. گۆشتی لەڕی بێچەوری ٣. قەڵشت لە بەردی زلدا ⊡ ١. کُهنەپاره ٢. گوشت لاغر بدون چربی ٣. شکاف در سنگ بزرگ

**شیقین** / şîqîn/: چاوگ. زیقاندن؛ قیژاندن ⊡ جیغ زدن

**شیک**[1] / şîk/: ناو. خەت ⊡ خط

**شیک**[2] / şîk/: ئاوەڵناو. ١. لووکس ٢. بالابەرز ⊡ ١. شیک؛ لوکس ٢. بلندقد

**شیکار** / şîkar/: ناو. ١. هەلاج؛ ئەوەی لۆکە و خوری شی دەکاتەوە ٢. لێکدەرەوە؛ کەسێ کە

بابـەت یـان ڕووداوێ لـە ڕووی پاژەکانییـەوە لێکدەداتەوە ☰ ۱. حلاج ۲. تحلیل‌گر

**شیکارانە** / şîkarane/: ئاوەڵناو. لێکدەرەوانـە؛ بـە شـێوەی شـیکاری ‹فەلسـەفەی شـیکارانە› ☰ تحلیلی

**شیکاری** / şîkarî/: نـاو. ڕەوتی لێکدانـەوە و شـی کردنەوەی مژارێکـی ئاڵـۆز یـان دژوار بـە سـەر بەشـگەلی بچـووکتر بـە مەبەسـتی باشـتر تێگەیشتن لەو مژارە ☰ تحلیل

**شیکاڵ**[1] / şîkał/: نـاو. ۱. تیتـۆڵ؛ بزگـوڕ ۲. سەرەقەیچی؛ دەمەقـەیچی ☰ ۱. تکـە ـ پـارە ۲. بازمانده از بُرش

**شیکاڵ**[2]: ئاوەڵناو. نەرمان ☰ نـرم و بـدون سـنگلاخ (زمین)

**شـیکراو** / şîk(i)raw/: ئاوەڵـناو. شـیکراوە؛ شـیەوکراو: ۱. هـەلاجی‌کـراو؛ لەبەریـەک هەڵوەشاوی خوری و موو ۲. *(مەجاز)* تاقیق‌کراو و لێکۆڵراوە ☰ ۱. حلاجی‌شده ۲. تحلیل‌شده

**شیکراوە** / şîk(i)rawe/: ☜ **شیکراو**

**شیکراوەوە** / şîk(i)rawewe/: ئاوەڵـناو. هلکەوشـاندی ☰ بررسی‌شده

**شیکە** / şîke/: ناو. بەچکـە بـەرازی دوو ساڵـە ☰ بچه خوک دوساله

**شیکەرەوە** / şîkerewe/: ناو. تۆژەرەوە ☰ پژوهشگر

**شیلافە** / şîlafe/: ☜ **شیلاڤک**

**شیلاڤ** / şîlav/: نـاو. ۱. شیلک؛ گوڵێکی بـێ‌بۆنـە ۲. ☜ **شیلاڤک** ☰ ۱. گلی بی‌بو ۲. ☜ **شیلاڤک**

⊡ **شیلاڤ کرن**: هەڵچوون؛ سەرڕێژ کردن لـە بـەر کوڵین ☰ سر رفتن در اثر جوشیدن

**شـیلاڤک** / şîlavik/: نـاو. شـیلافە؛ شـیلاڤ؛ شیلاوک؛ شیلاوگ؛ شیلک: ۱. هـەوێنی پـەنیر ۲. جێگەی خواردنی هەزم‌کراو لە ورگی مـالاتی کاوێژکەردا کە بـۆ هـەوێنی پـەنیر دەبـێ ☰ ۱. مایەی پنیر ۲. شیردان

**شیلاق** / şîlaq/: ناو. ۱. قـوڕ و چڵـپاو ۲. شـەلاخ؛ قامچی ☰ ۱. گِل‌ولای ۲. شلاق

**شیلاقە** / şîlaqe/: ☜ **شەپەزلە**

**شیلان** / şîlan/: نـاو. ۱. نـاوی دارچکێکـی گـەڵا پێنج یا حەوت‌پـەڕی گـوڵ‌تـاک یـان کۆیـە ۲. گوڵـی ئـەو دارچکـە کـە بـە ڕەنگـی سـپی و ئاماڵ‌سوورە لە گوڵی ڕۆز دەکا بەڵام گچکـەتر و کەم‌پەڕترە ۳. مـوورووی سـووری زەنبـەر ☰ ۱. نسترن کوهی ۲. گل نسترن ۳. مُهره‌های ریز قرمز

**شیلانگ** / şîlang/: ☜ **شلەنگ**

**شیلانگەر** / şîlanger/: ناو. چەکساز؛ تفەتنگسـاز. هەروەها: **شیلانگەری** ☰ اسلحه‌ساز

**شیلانەدەشتی** / şîlanedeştî/: نـاو. گوڵەسـەگانە؛ نەستەرەن ☰ نسترن

**شیلاو** / şîlaw/: ناو. ڕووگ؛ دۆشاو؛ دس؛ شـیلەی ترێی کولاو ☰ شیره‌ی انگور

**شیلاوک** / şîlawik/: ☜ **شیلاڤک**

**شیلاوگ** / şîlawig/: ☜ **شیلاڤک**

**شیلاوگە** / şîlawge/: نـاو. شـیلەی میـوە تـا بـە دارەوەیە ☰ صمغ درخت تا زمانی که روی درخـت است

**شیلپاخ** / şîlpax/: ☜ **شەپەزلە**

**شـیلخە** / şîlxe/: ئاوەڵـناو. خاویلکـە؛ هـیچ لـێ نەهاتوو ☰ دست‌وپا چُلُفتی

**شیلک** / şîlik/: نـاو. ۱. ☜ **شـیلاڤ ـ۱** ۲. ☜ **شیلاڤک**

**شیلماق** / şîlmaq/: ناو. ڕیپۆقی چاو ☰ ژَفَک

**شیلۆ** / şîlo/: ☜ **شلوێ**

**شیلە** / şîle/: نـاو. ۱. شیرەی گیـا و دار ۲. ددانی مالات و جوانووە ئەسپی سێ ساڵە، کە لە پێـنج ساڵـیدا دەکـەوێ ۳. ڕەواق؛ شـەربەتێ کـە بـە هۆی زۆر کوڵانەوە خەست بـووە ☰ ۱. شـیرابه ۲.

دندان شیری حیوان ٣. شربت غلیظ

**شیلە پە** / şîlepe/: ☜ **شیرەپە**

**شیلەتێن** / şîletên/: ☜ **شیلەوگەرم**

**شیلەجۆ** / şîleco/: ناو. فەریکی جۆ؛ جۆی هێشتا دەنک ڕەق‌نەبوو ☰ دانەی جو هنوز سفت نشده

**شیلەسواغ** / şîles(i)wağ/: ناو. کاری سواغ دانی دار و دیوار بە قوڕاوی سپی ☰ گل‌سپید اندودی دیوار

**شیلەک** / şîlek/: ناو. ١. تفەزەوینە؛ توەفەرەنگی ٢. کاری خۆ بە جۆرێ تایبەتی شاندان ☰ ١. توت‌فرنگی ٢. ژست

**شیلەمار** / şîlemar/: ناو. سوجەمار ☰ نوعی مار سرخ‌رنگ

**شیلەوتین** / şîlewtîn/: ☜ **شیلەوگەرم**

**شیلەوگەرم** / şîle w germ/: ناوەڵناو. شەلۆ؛ شیرتێن؛ شیرتین؛ شیرەوتین؛ شیلەتێن؛ شیلەوتین؛ شەرتین؛ شیتین؛ شێتین؛ ملەما؛ مەڵەما؛ نیوەگەرم؛ نیمەگەرم؛ شیرەگەرم؛ شیلە و گەرم؛ تین‌گەرم؛ تایبەتمەندی ئاوی نە سارد و نە داخ ☰ ولرم

**شیلی**[١] / şîlî/: ناو. شیلە؛ شیرە ☰ شیرابه

**شیلی**[٢]: ☜ **شلوێ**

**شیما** / şîma/: ناو. مەلبەزە؛ وێنەیەکی بێوردەکاری کە بە چەند هێڵ بابەتەکە بگەیێنێ ☰ شِما

**شیمانە** / şîmane/: ناوەڵناو. شیمانی؛ شایەدی؛ لەوانە بوون ☰ احتمالی

**شیمانی** / şîmanî/: ☜ **شیمانە**

**شیمڕ** / şîmiř/: ناو. شالاو؛ هێرش ☰ یورش

**شیمک** / şîmik/: ☜ **شیمۆک**

**شیمۆک** / şîmok/: ناو. شیمک: ١. کەوشی پاژنە نووشتاوە ٢. ژێرڕێسمە؛ پاژنەی دەرگا ☰ ١. کفش پاشنه تا شده ٢. پاشنه‌ی در

**شیمی** / şîmî/: ناو. ١. ☜ **شەڵغەم** ٢. ☜ **شەلەمین** ٣. کیمیا؛ زانستی پێکهاتەی بنەمایی ماک و تێکئالاوی، گۆڕان، پێکهاتن، کاردانەوە، شیکاری و بەرهەم هێنانی هەموو ماکێ ☰ ١. ☜ **شەڵغەم** ٢. ☜ **شەلەمین** ٣. شیمی

**شیمیایی** / şîmyayî/: ناوەڵناو. کیمیایی، کیمیاوی ☰ شیمیایی

**شیمی‌زان** / şîmîzan/: ناو. کیمیاگەر؛ کیمیازان ☰ شیمیدان

**شیمێ** / şîmê/: ناو. ١. تڕپچە؛ توورە سوورە ٢. دڕی؛ تووترک ☰ ١. تُرُبچه‌ی قرمز ٢. تمشک

**شین**[١] / şîn/: چاوگ. چوون؛ ڕۆیشتن ☰ رفتن

**شین**[٢]: ناو. ١. کەوگ؛ ئاوی؛ ڕەنگی ئاسمان ٢. ڕەنگی گیا؛ سەوزی تۆخ ‹ئەی شێخی تەریقەت! ئەی لە سەر تا پا شین!/ بەم ڕیشە بەسم فریو دە! با بیتاشین! «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ٣. شیوەن؛ شەپۆڕ ٤. ناوی پیتی شازدەهەمی ئەلفوبێی زمانی کوردی ☰ ١. رنگ آبی ٢. سبز سیر ٣. شیون ٤. شین

▣ **شین بۆ کردن**: بۆ کەسێ گریان و ڕۆڕۆ کردن؛ وەیرۆ کردن بۆ کەسێ ☰ شیون کردن برای کسی

**شین چوونەوە**: شین کردنەوە؛ لە دوورەوە بە کەوە ڕەنگ هاتنە بەر چاو؛ دیمەن سەوز نواندن ☰ از دور سبز یا کبود جلوه کردن

**شین کردن**: ١. ڕواندنی ڕوەک ٢. کەوە ڕەنگ کردن ٣. شەپۆڕ کردن؛ گریان و وەیرۆ کردن ☰ ١. رویاندن ٢. کبود کردن ٣. شیون کردن

**شین گێڕان**: ئازیەتی گرتن ☰ عزا گرفتن

**شین**[٣]: ناوەڵناو. ١. کەوگ/ ئاوی ڕەنگ؛ بە ڕەنگی ئاسمان ‹لە ژێر ئاسمانی شینا› ٢. بە ڕەنگی گیا (سەوزی تۆخ) ‹دەشتی شین› ☰ ١. آبی رنگ ٢. به رنگ سبز سیر

▣ **شین بون**: ۱. سەوز بوونی گیا و دار ۲. ڕوانی گیا و دار ☰ ۱. سبز جلوه کردن نباتات ۲. رُستن نباتات

**شین بونەوە**: ۱. دووبارە سەرهەڵدانەوەی ڕوەک ۲. لە پێکەنین تاسان ۳. پیران کردنی منال لە گریان ٤. *[کینایە]* دەس هەڵنەگرتن و پێ‌چەقاندن لە ویستنی شتێکدا ‹تۆ بۆ لە من شین بوویەوە و دەس بەر نادەی؟!› ☰ ۱. دوباره سبز شدن نباتات ۲. از خنده رودەبُر شدن ۳. ریسه رفتن کودک ۴. اصرار کردن و سماجت زیاد در خواستن چیزی

**شیناتی** / şînatî/: ناو. ۱. ☜ **شینایی** ۲. ☜ **شیناوەرد**

**شیناخ** / şînax/: ناو. چۆڵەمە؛ چەڵەمە ☰ جناغ

**شیناورد** / şînawird/: ☜ **شیناوەرد**

**شیناوەرد** / şînawerd/: ناو. شیناورد؛ شیناتی؛ چێندراوی هاوینە ☰ کشت صیفی

**شیناهی** / şînahî/: ☜ **شینایی**

**شینای** / şînay/: ☜ **شاندن**

**شینایی** / şînayî/: ناو. شیناتی؛ شیناهی: ۱. سەوزایی زەمین ۲. *[کینایە]* چێندراوی هاوینە ☰ ۱. نمای سبز زمین ۲. صیفی‌جات

**شینباو** / şînbaw/: ناو. ڕەنگی سپی ئامال کەوە ☰ سپید کبودفام

**شینبۆر** / şînbor/: ناو. کەوەی ئامال بۆر ☰ خاکستری تیره

**شین‌بو** / şînbû/: ئاوەڵناو. ڕواو ☰ رویيده

**شینبەر** / şînber/: ئاوەڵناو. دیار؛ خویا؛ ناسراو ☰ مُشخص؛ معلوم

**شین‌بەش** / şînbeş/: ئاوەڵناو. خۆڵەمیشی نێو چاوان سپی (کەڵ و گامێش) ☰ خاکستری پیشانی سفید (گاو گاومیش)

**شینتر** / şîntir/: ناو. بزگور و دادڕاوی بە تەکەتەکی جلکی شڕ ☰ پارەهای لباس مُندرس

**شین‌تۆخ** / şîntox/: ناو. کەسکەتاری؛ سەوزی تۆخ ☰ سبز لجنی

**شینخۆر** / şînxor/: ناو. پێشخۆر؛ بەرخۆر بە شینی فرۆشراو (زرعات) ☰ سلم فروخته

**شین‌شینک** / şînşînik/: ناو. جۆرێ مارمێلکەی درێژ و ئەستوورتر لە مارمێلکەی ئاسایی کە لە بەهاردا ڕەنگی شینە ☰ نوعی مارمولک

**شینک** / şînik/: ناو. ۱. شوتک؛ شیتک؛ پشتێند ۲. تێلای گەلاکوت ۳. دارێکی لێڕەوارە بەرێکی خواردەمەنی هەیە ☰ ۱. کمربند ۲. چوب برگ‌کوب ۳. درختی جنگلی

**شینکاتی** / şînkatî/: ناو. شینکایەتی؛ سەوزایی دەشت و دەر ☰ سبزی دشت و صحرا

**شینکایەتی** / şînkayetî/: ☜ **شینکاتی**

**شینکە** / şînke/: ناو. ۱. گیا و گژی تازە سەردەرهێناو لە دەشت و سارا ۲. جۆرێ تفەنگ ۳. جۆرێ زیپکەی پێست ٤. جێ خیز و ڕەمڵ ٥. کوانێکی زۆر بە ئازاری پەنجەیە ٦. جۆری گەنەی وردە بە تۆپەڵ بە گوێچکەی مالاتەوە دەنووسێ ☰ ۱. سبزەی تازە بردمیدە ۲. نوعی تفنگ ۳. نوعی جوش ۴. ریگستان ۵. دُملی دردناک در پنجه ۶. نوعی کنەی ریز

**شینکی** / şînkî/: ناو. ۱. ڕەنگی خۆڵەمێش ۲. سەرگەلای تووتن کە دەیچنن ☰ ۱. خاکستری رنگ ۲. سربرگ تنباکو که می‌چینند

**شینگایی** / şîngayî/: ناو. گەرمەشین؛ شین و شەپۆڕ ☰ شیون

**شینگێڕ** / şîngêř/: ناو. تازیەبار ☰ عزادار

**شینگێڕی** / şîngêřî/: ناو. تازیەباری ☰ عزا داری

**شین‌نامە** / şînname/: ناو. کاری بە مردوودا هەڵگوتن ☰ مرثیه

**شین‌وزاری** / şîn û zarî/: ناو. شین و گریان؛ شین

و شه‌پۆڕ ‹هه‌ر ئازام په‌ی ویش شین‌وزاریشه‌ن/ لاله و ناڵه‌ی سه‌خت زام کاریشه‌ن «مه‌وله‌وی»› ≋ شیون گروهی

**شین‌وشه‌پۆڕ / şîn û şepoř/**: ناو. شیوه‌ن و گریان به کۆمه‌ڵ ‹بوو شین‌وشه‌پۆڕ له ناو جزیری/ گش پیاو و ژنێک و لاو و پیری «هه‌ژار، *مه‌م و زین*»› ≋ شیون گروهی

**شین‌ومۆر / şîn û mor/**: ئاوه‌ڵناو. تایبه‌تمه‌ندی ئاسمانی پڕ له هه‌ور و ڕووگرژ ≋ ابری و تیره (آسمان)

**شین‌ومۆڕ / şîn û moř/**: ئاوه‌ڵناو. *[کینایه]* ڕووگرژ؛ ڕووترش؛ ناوچاوتاڵ ≋ اخمو

**شینۆ / şîno/**: ناو. سه‌رناوی گورگ ≋ لقب گرگ

**شینۆک / şînok/**: ناو. ۱. جۆرێ قه‌زوان ۲. شینگێڕ؛ که‌سێ که له خه‌مان هه‌ر ده‌گری و ژیر نابێته‌وه ≋ ۱. نوعی چاتلانقوش ۲. کسی که از گریه نمی‌آساید

**شینه / şîne/**: ناو. لکه‌داری بڵند و له گه‌شه ≋ شاخه‌ی بلند و شاداب

**شینه‌بی / şînebî/**: ☜ شۆڕه‌بی

**شینه‌ده‌مار / şînedemar/**: ناو. شاڕه‌گێک له له‌شدا ≋ از شاهرگ‌های وریدی

**شینه‌شاوه / şîneşawe/**: ☜ شینه‌شاهۆ

**شینه‌شاهۆ / şîneşaho/**: ناو. شاڤه‌شین؛ شاڤاشین؛ شینه‌شاوه؛ واق ≋ بوتیمار

**شینه‌قورینگ / şînequrîng/**: ناو. باڵنده‌یه‌که له تۆره‌مه‌ی قورینگ، نزیک ۱۲ سانتی‌میتر ده‌بێ، شینی سورمه‌ییه، سه‌رکلکی ڕه‌شه، خه‌تێکی سپی له لاجانگییه‌وه ده‌ست پێ‌ده‌کا و هه‌تا سه‌ر شانی ده‌ڕوا، له نزیک نێوچاوانی سوور ده‌نوێنێ، زۆر سڵه، له‌سه‌رخۆ و هێدی هه‌نگاو ده‌نێ، کۆچه‌ره و به گه‌ل ده‌گه‌ڕێ ≋ دُرنا

**شینه‌مار / şînemar/**: ناو. شینی گاوه‌نگی؛ جۆرێک ماری مه‌ترسیدار و ژه‌هراوییه، بن سکی زه‌رد و سه‌ر پشتی شینه ≋ نوعی مار سمی

**شینه‌مۆزه / şînemoze/**: ناو. که‌رمۆز؛ مێشێکی چزووداری درشته به مالاته‌وه ده‌دا ≋ نوعی مگس درشت نیشدار

**شینی‌گاوه‌نگی / şînîgawengî/**: ☜ شینه‌مار

**شیو[1] / şîw/**: ناو. ۱. بالاڤ؛ بالاو؛ کاری جل شتن ۲. دۆڵی ته‌نگ ۳. چێشت؛ خۆراکی لێنراو ≋ ۱. رختشویی ۲. دره‌ی تنگ ۳. غذای پُخته

**شیو[2]**: ئاوه‌ڵناو. ↓

⊡ **شیو بوونه‌وه**: له‌به‌ر یه‌ک هه‌ڵپچڕان ‹په‌ته‌که شیو بووه‌ته‌وه› ≋ وارفتن

**شیوا / şîwa/**: ناو. له ئایینه هێندووه‌کان که له سه‌ر په‌رستشی خودای نابوودی و ژیانه‌وه دامه‌زراوه و له شێوه‌ی که‌سێکدایه که له سه‌ر پێستی به‌بر دانیشتووه و مارێکیشی له سه‌ر شان یان له په‌نایه ≋ شیوا

**شیواره / şîware/**: ئاوه‌ڵناو. سه‌ربزێو؛ ئه‌شقی ≋ یاغی؛ سرکش

**شیواز / şîwaz/**: ☜ شێواز

**شیوت / şîwit/**: ☜ شویت

**شیوعی / ş(i)yu'î/**: ئاوه‌ڵناو. سوور؛ کومۆنیست ‹حیزبی شیوعی› ≋ کمونیست

**شیوکه‌ر / şîwker/**: ناو. ئاشپه‌ز ≋ آشپز

**شیوه‌ران / şîweran/**: ناو. خاکشیر؛ به‌ری وردی گیایه‌که بۆ ڕه‌وانی باشه ≋ خاکشیر

**شیوه‌غه‌ریبه / şîweğerîbe/**: ناو. ئه‌و نان و پێخۆره‌ی خه‌ڵک له پرسه و سه‌ره‌خۆشیدا دروستی ده‌که‌ن و ده‌یبه‌ن بۆ مزگه‌وت و ماڵی مردوو ≋ غذایی که در مجلس ختم همسایه‌ها به مهمانان می‌دهند

**شیوه‌ڵ / şîweł/**: ☜ شیوه‌ڵه

**شیوه‌ڵووکه / şîwełûke/**: ☜ شیوه‌ڵه

**شیوەڵە / şîweļe/**: ناو. شیڤک؛ شیڤەلۆک؛ شیوەڵ؛ شیوەڵووکە؛ دۆڵ و شیوی چکۆڵە ☰ درّەی کوچک

**شیوەن / şîwen/**: ناو. شەپۆڕ؛ گریان و هاواری بە کۆمەڵ بۆ مردوو ☰ شیون

⊡ **شیوەن کردن:** ☜ **شیوەن گێڕان**

**شیوەن گێڕان:** شیوەن کردن؛ گریان و لە خۆ دان بۆ مردوو ☰ شیون راه انداختن

**شیوەنگا / şîwenga/**: ناو. جێگەی شین و شەپۆڕ ☰ شیونگاه

**شیویەی / şîwyey/**: ☜ **شێوان**[1]

**شیەم / ş(i)yem/**: ☜ **شیڤ**

**شیەنەچیر / ş(i)yeneçîr/**: ناو. حەریف؛ هاوملە؛ هاوکێشە ☰ حریف

**شیەوکراو / ş(i)yek(i)raw/**: ☜ **شیکراو**

**شیەی / ş(i)yey/**: چاوگ. چوون؛ ڕۆین ☰ شُدن

**شێ**[1] **/ şê/**: ناو. ١. ڕەنگی ڕەش ٢. نم؛ تەڕایی ٣. توانایی ٤. ناوی شازدەهەمین پیتی ئەلفبای زمانی کوردی ☰ ١. رنگ مشکی ٢. نم ٣. توان ۴. شین؛ حرف شانزدهم الفبای کُردی

⊡ **شێ دانەوە:** نم گەڕاندنەوە ☰ نم پس دادن

**شێ**[2]: ئاوەڵناو. (هەموو بۆ ئەسپ و چوارپەل): ١. زەردی ئاماڵ سوور ٢. سپی بە پنۆکی سوور ٣. ڕەنگ سووری پنۆک سپی ٤. سێپەل سپی ☰ ١. زرد مایل به سرخ ٢. سفید با خال‌های قرمز ٣. سُرخ با خال‌های سفید ۴. سه پا سفید

**شێپ / şêp/**: ناو. دەرە و دۆڵی تەنگ و باریک ☰ درّەی تنگ

**شێت**[1] **/ şêt/**: ناو. دین ‹شێت، بۆ کاری خۆی ژیرە «مەسەل»› ☰ دیوانه

**شێت**[2]: ئاوەڵناو. ١. دێوانە؛ لێوە ٢. ئارام‌لێبڕاو ‹ئەو تەرزە ڕەفتار و قسانە، قاسمی تەواو شێت و هار کردبوو «هەژار، چێشتی مجێور»› ٣. زۆر بە تاسە ‹میللەتێکن بۆ نەمانی یەکتری هەر هەوڵئەدەن/ داخەکەم ورد و درشتی شێت و شەیدای ئانەیە! «بێکەس»› ☰ ١. دیوانه ٢. بی‌قرار ٣. مُشتاق

**شێتئاسا / şêt'asa/**: ئاوەڵکار. شێتانە؛ وەک شێتان ☰ دیوانەوار

**شێتانە**[1] **/ şêtane/**: ئاوەڵناو. بە دوور لە ئاوەز ‹کاری شێتانە› ☰ نابخردانه

**شێتانە**[2]: ئاوەڵکار. وەک شێتان؛ شێتئاسا ‹پێوانی تەمەن گەییشتە حەفتا، تا کەی/ خۆم هەر وەکوو هەم نیشان نەدەم شێتانە؟ «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ☰ دیوانەوار

**شێتایەتی / şêtayetî/**: ☜ **شێتی**

**شێتخانە / şêtxane/**: ناو. دینگە؛ جێگەی شێتان ☰ تیمارستان

**شێتکە / şêtke/**: ☜ **شێتۆکە**

**شێتگیر / şêtgîr/**: ☜ **شێلگیر**

**شێتگیری / şêtgîrî/**: ئاوەڵناو. شێلگیری ☰ اصرار

**شێتوشڕ / şêt û şiř/**: ☜ **شڕوشێت**

**شێتوشەواک / şêt û şewak/**: ئاوەڵناو. [پلار] دڵسادەی هیچ‌نەزان ☰ سادەلوح

**شێتووێت / şêt û wêt/**: ئاوەڵناو. [پلار] تێنەگەیشتووی بێ‌ئاگا لە هەموو شت ‹نە تۆی حەلقەی زولف دڵەی شێتووێت/ شەرتش کەرد هەنی دڵ نەدەرۆ پێت «مەولەوی»› ☰ خُل‌وچل

**شێتوهار / şêt û har/**: ئاوەڵناو. ئارام‌لێبڕاو ☰ ناآرام

**شێتۆکە / şêtoke/**: ئاوەڵناو. شێتکە؛ بەستەزمانۆکە؛ سادە و بێ‌فێڵ و فەرەج ☰ خُل مزاج

**شێتەڵ / şêteļ/**: ئاوەڵناو. شەیدا؛ ئاشقی دێوانە ☰ شیدا

**شێتەوژێرە / şête w jîre/**: ئاوەڵناو. عەنتەرمەزاج؛ تاوتاوی؛ حولحولی؛ هەردەم لە سەر خەیاڵێک

🇮🇷 دمدمی

**شێتی / şêtî/:** ناو. شێتایەتی؛ لێوەیی؛ لێوەگی؛ لێوەی؛ دێوانەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی دێوانە بوون 🇮🇷 دیوانگی

**شێتین / şêtîn/:** ☜ **شیلەوگەرم**

**شێخ / şêx/:** ناو. ١. پیری تەریقەت ٢. سەید؛ لە نەتەوەی پێغەمبەر 🇮🇷 ١. پیر طریقت ٢. سیّد

**شێخانە / şêxane/:** ناو. جۆرێ گۆرانی عیرفانی بێ هاوڕێیی ساز 🇮🇷 نوعی آواز عرفانی

**شێخانی / şêxanî/:** ناو. جۆرێ داوەت و هەڵپەڕکێ 🇮🇷 نوعی رقص

**شێخز / şêx(i)z/:** ناو. جۆرێک ماینی مەیلەو خۆڵەمێشییە 🇮🇷 نوعی مادیان خاکستری

**شێخنشین / şêxn(i)şîn/:** ناو. هەرێمی حکوومەتی شێخە عەرەبەکان 🇮🇷 شیخ‌نشین

**شێخەڵ / şêxeł/:** ناو. نەمامی یەکساڵەی بەڕوو و مازوو 🇮🇷 نهال یک سالەی بلوط و مازوج

**شێخی / şêxî/:** ناو. هەر یەکە لە شوێنکەوتوانی دەستی ئایینی شێخییە 🇮🇷 شیخی

**شێخییە / şêxîye/:** ناو. تاقمێک لە موسوڵمانانی شیعەی دوازدە ئیمامی کە خۆیان بە شوێنکەوتووی شێخ ئەحمەدی ئیحسایی (١١٦٦-١٢٤١ کۆچی ـ مانگی) دەزانن 🇮🇷 شیخیە

**شێدار / şêdar/:** ئاوەڵناو. شەدار؛ نەمدار 🇮🇷 نمناک

**شێدوبێد / şêd û bêd/:** ناو. جەلال و شکۆ 🇮🇷 شکوه و جلال

**شێر / şêr/:** ناو. ١. گیانەوەری گوانداری گەورەی گۆشتخۆر و (زۆرتر) شەوڕاو، پێست ئەسمەر، کلک درێژ و گوڵینگدار، نێرەکەی بە یاڵی چڕی ڕەش یان قاوەیی تۆخەوە، کە لە ناوچەگەلی ئاواق یان کوێستانی (قامیشەڵان، زێواری لێڕەواران) وڵاتانی گەرمەسێری، بەتایبەت لە ئافریقادا دەژی ٢. ☜ **شیر ـ٢** ٣. بەلوغە؛ موسلوخ؛ ئامرازی بەستن و باز کردنی ئاو و تراو کە لە سەری لوولە، بنی دەفر یان خەزێنەیەکدایە ٤. دیوی شێر لە سکەی شێر و خەتدا 🇮🇷 ١. شیر جنگل ٢. ☜ **شیر ـ٢** ٣. شیر آب ۴. شیر سکە

◙ **شێری چەش:** فێری نێچیر گرتن ‹وێنەی شێری چەش بنوێنە!/ دڵی دوژمن داخورپێنە! «گۆران»› 🇮🇷 شیر شکار

◙ **شێر یا ڕێوی بوون:** *[مەجاز]* سەرکەوتوو یان دۆڕاو بوون ‹دا دەی! چت کرد؟ شێری یا ڕێوی؟› 🇮🇷 برندە یا بازندە بودن

**بە سەر کەسێکدا شێر بوون:** *[کینایە]* ترسی خۆ بردنە دڵی کەسێک ؛ زاڵ بوون بە سەر کەسێکدا 🇮🇷 برای کسی شیر شدن

**شێرا / şêra/:** ئاوەڵناو. *[کینایە]* شێرە؛ ئازا و بەجەرگ 🇮🇷 دلاور

**شێرازی / şêrazî/:** ☜ **شیرازە**

**شێران[1] / şêran/:** ☜ **شێرانەوە**

**شێران[2]:** ناو. گەمەی شێر و خەت 🇮🇷 بازی شیر و خط

**شێرانخەت / şêranxet/:** ☜ **شێروخەت**

**شێرانە / şêrane/:** ئاوەڵناو. *[کینایە]* شێرانی؛ ئازانە؛ ئازایانە؛ وەک شێر 🇮🇷 شیرآسا

**شێرانەوە / şêranewe/:** چاوگ. شارانەوە؛ شێران؛ لە بەرچاو ون بوون 🇮🇷 پنهان شدن

**شێرانی / şêranî/:** ☜ **شێرانە**

**شێراوە / şêrawe/:** ئاوەڵناو. شاراوە؛ گومکراو لەبەرچاو 🇮🇷 پنهان‌شدە

**شێرپەنجە / şêrpence/:** ناو. کیفژاڵە؛ قرژاڵە؛ کورنجە؛ سەرەتان؛ واتەشەک؛ بێناوە؛ نەخۆشییەک بە هۆی تەشەنە کردنی بێڕادەی شانەگەلی لەش 🇮🇷 سرطان

**شێرخەت / şêrxet/:** ☜ **شێر و خەت**

**شێردراوه / şêrd(i)rawe/**: ☜ **شاراوه**

**شێرزاد / şêrzad/**: ناو. شێرکۆ؛ شێرکۆڵه؛ بێچووەشێر؛ بەچکەشێر ☰ بچه شیر

**شێرفەلەکە / şêrfeleke/**: ناو. فەلکە؛ شێرێکی سەردگرد بۆ بەستن و بەردانی تراو ☰ شیرفلکه

**شێرکۆ / şêrko/**: ☜ **شێرزاد**

**شێرکۆلە / şêrkole/**: ناو. شەپاڵ؛ بەچکەشێر ☰ بچه شیر

**شێرکۆڵە / şêrkołe/**: ☜ **شێرزاد**

**شێرگیر / şêrgîr/**: ☜ **شێلگیر**

**شێرمایی / şêrmayî/**: ناو. دەسکەخەنجەر ماسی؛ ئێسکی ئەستووری جۆرە ماسییەکە دەکرێتە دەسکە خەنجەر ☰ استخوان شیرماهی

**شێروان / şêrwan/**: ناو. شێرەوان؛ بەخێوکەر و ڕاگری شێر ☰ شیربان

**شێروانی / şêrwanî/**: ناو. جەمەلۆن ☰ شیروانی

**شێر و خەت / şêr û xet/**: ناو. شێرخەت؛ شێران‌خەت؛ بەرزیلان؛ ئەسکەملە؛ تەڕ و وشک؛ جۆرێ کایە یان گرێوە بە شێوەی هەڵخستنی سکەیەک و لە پێش گوتنی ئەوەی کە بە کام لادا دەکەوێ ☰ شیریاخط

**شێروکوت / şêr û kut/**: ناو. وشەیەکە کاتی هەڵبژاردنی تاکێک بۆ یاری دەگوتری ☰ اصطلاحی در بازی

**شێروکۆڵ / şêr û koł/**: ناو. نێلی بەرز کردنەوەی دار و دەستەکی میچ ☰ اهرم جابجایی تیرهای سقف

**شێرۆخ / şêrox/**: ناو. کاڵەی سەرچەرم ☰ چارق

**شێره[1] / şêre/**: ناو. شێر؛ ئامرازی کردنەوە و گرتنەوەی بۆری ئاو ☰ شیر آب

**شێره[2]**: ئاوەڵناو. زاڵ؛ چێر. هەروەها: **شێره بوون** ☰ مُسلّط

**شێرەبەفرینە / şêrebefrîne/**: ناو. پەیکەری بەفرینە بە شێوەی شێر ‹لە بیرمە شێرەبەفرینەم دەکرد، سواری دەبووم بێ‌زین/ نسا بوو جێگەکەی ئەیبەست، ئەما تاکوو دەمی هاوین «پیرەمێرد»› ☰ شیربرفی

**شێرەپیاو / şêrep(i)yaw/**: ناو. *[مەجاز]* مەرخوز؛ پیاوی ئازا ☰ شیرمرد

**شێرەژن / şêrejin/**: ناو. *[مەجاز]* ژنی بەجەرگ و لەسەرخۆ ☰ شیرزن

**شێرەکوڕ / şêrekuř/**: ناو. *[مەجاز]* کوڕی ئازا و دلێر ☰ پسر یا مرد شُجاع

**شێرەکوللە / şêrekulle/**: ناو. جۆرێ کلۆی زلی شین ☰ نوعی ملخ درشتِ سبزرنگ

**شێرەوان / şêrewan/**: ☜ **شێروان**

**شێڕنای / şêřnay/**: چاوگ. شیڕەشیڕ کردن ☰ جیغ و داد کردن

**شێز / şêz/**: ناو. مێشەسەگانە ☰ سگ‌مگس

**شێست / şêst/**: ☜ **شەس ـ٥**

**شێستەم / şêstem/**: ☜ **شەستەم**

**شێستەمین / şêstemîn/**: ☜ **شەستەمین**

**شێستیر / şêstîr/**: ناو. شەستیر ☰ آتشبار

**شێش[1] / şêş/**: ☜ **شەش**

**شێش[2]**: دەنگ. هێش؛ وشەی ڕاگرتنی چوارپێ لە ڕۆیشتن ☰ هُش

**شێشتیر / şêştîr/**: ناو. مترالیۆز؛ ئاگربار؛ ڕەشاش ☰ آتشبار

**شێعر / şê'r/**: ☜ **شیعر**

**شێعە / şê'e/**: ☜ **شیعە**

**شێف / şêf/**: ناو. شێو؛ شوو؛ شۆ؛ شۆم؛ شووم؛ شوویەم؛ شیەم؛ کاش؛ ڕەن: ١. هێڵ؛ کێڵ؛ ئەو هێڵانەی لە سەر زەوی هەڵدەکەنرێ ٢. هێتە؛ شێوەرد؛ وەرد؛ خەپر؛ گایار؛ جووت؛ جۆت؛ جفت؛ کار و ڕەوتی هەڵکەندنی زەوی بۆ چاندن ‹شەڕ لە شێف و ئاشتی لە خەرمان «مەسەل»› ☰

١و٢. شُخم

▣ **شێف بڕین**: کێلان؛ شێوەرد کردن؛ بە گاسن هەڵدڕینی زەوی شُخم زدن

**شێڤل** / şêfil/: ناو. زەمینی قووڵ نەکێڵدراو زمین سطحی شُخم زده

**شێفەلەتە** / şêfelete/: ناو. بەری داری کفر ثمر درختچه‌ای است

**شێڤ** / şêv/: ناو. ١. شێف؛ شێوەرد ٢. تاریکایی سەری شەو ١. شُخم ٢. تاریکی بعد از غروب

**شێڤان** / şêvan/: ناو. تاریکان؛ تەنگی نوێژی شێوان سرشب

**شێڤیار** / şêvyar/: ناو. دەشتەوان؛ جووتیار؛ فەلا کشاورز

**شێک** / şêk/: ناو. حەریف؛ هاوملە؛ هاوکێشە حریف

**شێل**[1] / şêl/: ناو. ١. ڕەخت و ئەسپابی ئەسپ ٢. شێوە؛ تەرز ١. یراق اسب ٢. شیوه

• **شێل**[2]: پاشەوشە. بشێل: ١. لێکدەر ‹هەویرشێل؛ قوڕشێل› ٢. ماڵێن ‹پشتشێل› ١. ـ چلان ٢. ـ مال

**شێلاقە** / şêlaqe/: ☜ **شەلاقە**

**شێلان** / şêlan/: چاوگ. تێپەر. //شێلات؛ دەشێلی؛ بشێلە// شێلاندن؛ شێلانن؛ شێلای؛ شێلتەی: ١. بە نهێم پەستاوتن ٢. ماڵین؛ مشت‌وماڵ دان ٣. *[مەجاز]* سەرکۆنە/ لۆمە کردن ٤. *[کینایە]* کوتان؛ لێدان ٥. ئاخنین؛ تەپاندن ٦. کوتانەوە؛ سفت کردنەوە ‹بانەکە تکە ئەکا، بچم بیشێلم› ١. چلاندن ٢. مُشت‌ومال دادن ٣. سرزنش کردن ۴. کُتک زدن ۵. آکندن ۶ کوبیدن و سفت کردن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەشێلان

**شێلاندن** / şêlandin/: ☜ **شێلان**

**شێلانن** / şêlanin/: ☜ **شێلان**

**شێلای** / şêlay/: ☜ **شێلان**

**شێلتەی** / şêltey/: ☜ **شێلان**

**شێلدران** / şêld(i)ran/: ☜ **شێلیان**

**شێلدراو** / şêld(i)raw/: ئاوەڵناو. پەستراو پایکوب شُده

**شێلران** / şêlran/: ☜ **شێلیان**

**شێلک** / şêlik/: ناو. پەلامار؛ هێرش؛ دەستڕێژ حمله

**شێلگ** / şêlig/: ناو. دەستڕێژی تفەنگ ‹کاتێ بوو بە کوڕ بیبەن بۆ ڕووی جەنگ/ بیکەن بە نیشان بۆ شێلگی تفەنگ! «قانع»› آماج

**شێلگیر** / şêlgîr/: ئاوەڵناو. پێداگر؛ شێرگیر؛ شێتگیر مصّر

**شێلگیری** / şêlgîrî/: ناو. پێداگری؛ پێکۆڵی؛ کاری پێ بە گەز دان؛ سوور بوون اصرار

**شێلم** / şêlim/: ☜ **شەلغەم**

**شێلمۆک** / şêlmok/: ناو. خەردالە؛ خەردالە؛ خەرتەلە؛ خەردەل؛ خەردەڵ؛ خەرتەل؛ غەردەل؛ گیایەکی ئالیکی یەکساڵان لە تیرەی ئیسیوەت و ئالات، چەن جۆری سپی و ڕەش و کێوی هەیە خردل

**شێل و بێلە** / şêl û bêle/: ☜ **شێلەوبێلە**

**شێلو** / şêlû/: ☜ **شلوێ**

**شێلە** / şêle/: ناو. شلە؛ پارچەیەکە نوعی پارچه

**شێلەگە** / şêlege/: ☜ **شەلەگە**

**شێلەوبێلە** / şêle w bêle/: ناو. شێل‌وبێلە نیرنگ

**شێلەهان** / şêlehan/: چاوگ. ڕاخوشین؛ بە خز ڕۆیشتن (مار و خزۆکی‌تر) خزیدن خزنده

**شێلیان** / şêlyan/: چاوگ. شێلدران؛ شێلران؛ شێلیای: ١. بە نهێم پەستێوران ٢. ماڵیان؛ مشت‌وماڵ دران ٣. *[مەجاز]* سەرکۆنە/ لۆمە کران ٤. ئاخنران؛ تێ‌تەپین ٥. کوترانەوە؛ کوتیانەوە ١. چلانیده شدن ٢. مُشت‌ومال داده شدن ٣.

سرزنش شدن ۴. آکنده شدن ۵. کوبیده شدن

**شێلیای** / şêlyay/: ☜ **شێلیان**

**شێلیل** / şêlîl/: ناو. جۆرێ تۆمی جۆ ⧉ نوعی دانەی جو

**شێڵانە** / şêłane/: ☜ **شڵانە**

**شێڵانێ** / şêłanê/: ☜ **شڵانە**

**شێڵەهان** / şêłehan/: چاوگ. شێڵەهین؛ ڕاخوشین ⧉ بر زمین خزیدن

**شێڵەهین** / şêłehîn/: ☜ **شێڵەهان**

**شێن** / şên/: ئاوەڵناو. جوان و لەبەردڵان ⧉ زیبا و دلپسند

**شێنا** / şêna/: ئاوەڵناو. توانا؛ بەهێز و تاقەت ⧉ توانا

**شێناهی** / şênahî/: ناو. توانایی؛ هێز ⧉ توانایی

**شێنە** / şêne/: ناو. ١. شنە؛ سروە ٢. شەتڵجاڕ ⧉ ١. نسیم ٢. نشازار

**شێنەر** / şêner/: ☜ **شانەر**

**شێنەوار** / şênewar/: ☜ **شوێنەوار**

**شێنەیی**[1] / şêneyî/: ناو. لەسەرخۆیی ⧉ شکیبایی

**شێنەیی**[2]: ئاوەڵکار. ↓

⊡ **بە شێنەیی**: لەسەرخۆ؛ هێدی؛ بەسەبرێ ⧉ به آرامی

**شێنی**[1] / şênî/: ناو. ١. ئاسوودەیی ٢. کۆبوونەوەی حەشامات ⧉ ١. آسایش ٢. اجتماع مردم

**شێنی**[2]: ئاوەڵناو. ١. ئارام؛ لەسەرخۆ ٢. گوڵکردوو؛ پشکووتوو ⧉ ١. آرام ٢. شکوفا

**شێو** / şêw/: ناو. ١. کاری گاسن لە زەوی دان ٢. شێف؛ زەمینی گاسن لێ دراو ٣. چێشت؛ خۆراکی لێنراو ٤. شام؛ ژەمی نان خواردنی سەر شەو ⧉ ١. شخم ٢. زمین شخم‌زده ٣. غذای پخته ۴. شام

**شێواز** / şêwaz/: ناو. شیواز: ١. بیچم و شکڵ ٢. هەڤۆت؛ چۆنیەتی ڕاهاتن ٣. ڕێکلاش؛ ئانەو؛ شێوەیەکی تایبەت لە بەڕێوە بردنی کارێک یان پێک‌هێنانی شتێکدا ‹ئەم هاوکارەمان شێوازی کاری هەر وایە› ٤. *[هونەر]* ڕێباز؛ شێوەیەکی دیاریکراو و تایبەت بۆ داڕشتن، هۆندنەوە و پێکهێنانی بەرهەمێکی هونەری ⧉ ١. هیئت و قیافە ٢. آموزش؛ تعلیم ٣. روش کاری ۴. سبک هنری

⊡ **شێواز کردن**: شێوە کردن؛ شکڵ و قلافەتی کەسێ ئاشنا هاتنە پێش چاو ‹ئەم کابرایە شێواز ئەکەم بەڵام باش نایەتەوە بیرم لە کوێ دیومە› ⧉ آشنا به نظر رسیدن

**شێوان**[1] / şêwan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //شێوای؛ دەشێوی؛ بشێوە// شێویان؛ شێویەی؛ شێویای: ١. پەرێشان بوون ٢. پشێوە و ئاژاوە هەستان ٣. شێوانەوە؛ شێویانەوە؛ تێکچوون ⧉ ١. پریشان‌حال شدن ٢. آشوب برپا شدن ٣. برهم خوردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: شێواو/ چاوگی نەرێنی: نەشێوان

**شێوان**[2]: ناو. ئێوارە؛ کاتی ئاوا بوونی ڕۆژ ‹بانگی شێوان› ⧉ غروب

**شێواندن** / şêwandin/: چاوگ. تێپەڕ. //شێواندت؛ دەشێوێنی؛ بشێوێنە// شێوانن؛ شێونای: ١. ئاڵۆزاندن؛ تێک‌وپێک دان ‹شەڕ و ناکۆکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی شێواندووە› ٢. تێکەڵ دان ‹باشی بشێونە با تێکەڵ بێ› ٣. شێواندنەوە؛ تێکدان ⧉ ١. پریشان کردن ٢. به هم زدن ٣. برهم زدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەشێواندن

**شێوانگا** / şêwanga/: ناو. تاریکان؛ چراکەران؛ بانگاف؛ شێوان؛ لە سەرەتای تاریک بوونی هەوا تا کاتژمێرێک دواتر ⧉ شامگاه

**شێوانن** / şêwanin/: ☜ **شێواندن**

**شێوانەوە** / şêwanewe/: چاوگ. شێویانەوە؛ تێکچوونەوە؛ دیسان هەڵشێوان ⧉ باز درهم ریختن

**شێواو** / şêwaw/: ئاوەڵناو. شێویاگ؛ شێویا؛ شیویاو؛ شـــێویاگەوە: ١. پەرێشـــانبـــوو ٢. تێکـــەڵ و بێسەرەوبەرە 🇮🇷 ١. آشفته ٢. به هم خورده

**شێواوی** / şêwawî/: ناو. شێویاگی؛ تێکەڵ پێکەڵی 🇮🇷 آشفتگی

**شێوت** / şêwet/: ☜ شویت

**شێور** / şêwir/: ناو. شیرەت؛ تەگبیر 🇮🇷 مشورت

**شێوکراو** / şêwk(i)raw/: ئاوەڵناو. کێڵراو؛ کێڵدراو 🇮🇷 شخمزده

**شێونای** / şêwnay/: ☜ شێواندن

**شێوە**[١] / şêwe/: نـاو. ١. شـێواز؛ شـکڵ؛ بـیچم؛ قەلافەت ‹شێوەی وەنەوشـە هـا بـە خالـەوە/ بـەو گۆنـای گـوڵڕەنـگ بـووم لالـەوە «بێسـارانی»› ٢. ڕەوشـت و ئاکـار ‹بـەو زارەی لـە زەردەزیـزە/ بـە ئارامی کە شێوەی دلمەندیی تۆیە/ مەڵێ بەس ئـەم گفتوگۆیـە «سـوارە»› ٣. شـێوەزار ‹بـە شـێوەی موکوریانی قسە دەکا› ٤. تەڵەکە؛ فریـو ‹وا دیـارە ئەم کابرایە شێوەیەک لە کاریـدا هـەبێ› ٥. جـۆر؛ چەشن ‹بە هیچ شێوەیەک سەر ناهێنێتە ڕاسـتی› 🇮🇷 ١. شکل و سیما ٢. شیوه؛ منش و رسم و عـادت ٣. گویش ٤. مکر و فریب ٥. روش

⊡ **شێوە کردن**: ١. ☜ **شـێواز کـردن** ٢. فـێڵ و تەڵەکە کردن 🇮🇷 ١. ☜ **شێواز کردن** ٢. مکر و حیله کردن

**- شێوە**[٢]: پاشەوشـە. ڕواڵەت؛ سیما ‹پەریشێوە› 🇮🇷 - وش؛ - چهره

**شـێوەخوار** / şêwex(i)war/: نـاو. کـاری مـەڕ لەوەڕاندنی ئێواران، پاش دۆشین 🇮🇷 به چرا بردن عصر هنگام گله، بعد از دوشیدن

**شێوەر** / şêwer/: ناو. ١. شـێواز؛ شـێوەی دەم و چاو ٢. دارشتەی بینا و ڕێگا و کاری هونـەری و ... 🇮🇷 ١. سیما؛ قیافه ٢. طرح؛ نقشه

**شـێوەرد** / şêwerd/: نـــاو. زەوی کێڵـــدراوی دانەچێندراو 🇮🇷 زمین شُخمزده قبل از کشت

**شێوەرە** / şêwere/: ناو. گەشە؛ تێراوی و تـورتی و شەقی ‹ئەم باخە قەت شێوەرەی باشـی بـە خـۆوە نەدیوە› 🇮🇷 شادابی

**شێوەزار** / şêwezar/: نـاو. هـەرکام لـە جۆرەکـانی زمانێ کە بە وشە، ڕێزمان و بێژە لە لکەکانیتـری ئەو زمانە جیا دەبێتەوە 🇮🇷 گویش

**شێوەژنە** / şêwej(i)ne/: ئاوەڵناو. ئاژاوەگێڕ؛ بشێونە 🇮🇷 آشوبگر

**شێوەقولانێ** / şêwequłanê/: ☜ شێوەقوڵە

**شێوەقوڵە** / şêwequłe/: ناو. شێوەقولانێ؛ چێشتە قوڵەی منالان کە تێکەلاوی دەکەن و پێکـەوەی دەخۆن 🇮🇷 از خوراکیهای کودکان

**شێوەکار** / şêwekar/: ☜ شێوەکێش

**شێوەکێش** / şêwekêş/: نـاو. شـێوەکار؛ نـەققاش؛ وێنەکێش؛ نیگارکێش 🇮🇷 نقّاش

**شێوی** / şêwî/: نـاو. سەرنشـێو؛ سـەربەرەژێر 🇮🇷 سراشیبی

**شێویا** / şêwya/: ☜ شێواو

**شێویاگ** / şêwyag/: ☜ شێواو

**شێویاگەوە** / şêwyagewe/: ☜ شێواو

**شێویان** / şêwyan/: ☜ شێوان[١]

**شێویانەوە** / şêwyanewe/: چاوگ. ١. شـێوانەوە ‹کەپرەکـەمان شـێویاوە› ٢. دیسـانەوە شـێوان و پەرێشـانحـاڵ بـوون ‹ئـەها کـاکم هـەم دیسـان شێویاوە!› 🇮🇷 ١. خراب شدن؛ به هم خـوردن ٢. بـاز آشفته شدن

**شێویاو** / şêwyaw/: ☜ شێواو

**شێویای** / şêwyay/: ☜ شێوان[١]

**- شێوێن** / -şêwên/: پاشەوشە. ئـەوەی دەشـێوێنێ ‹گێرەشێوێن› 🇮🇷 - آشوب؛ برهم زننده

**شێوێنران** / şêwênran/: چاوگ. شێویان؛ تێکدران 🇮🇷 به هم ریخته و آشفته شدن

# ع

**ع** / ʼ/: پیت. نیشانەی حەڤدەهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی زمانی کوردی ■ ع؛ نشانەی هفدهمین حرف الفبای کُردی

**ع** / iʼ/: ناو. حەڤدەهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی زمانی کوردی ■ ع؛ هفدهمین حرف الفبای کُردی

**عا**[1] / aʼ/: ناو. *[مندالانە]* عە؛ ڕیان بە زاراوەی مندالانە ■ عَن

**عا**[2]: دەنگ. عە؛ وشەی دەنگ دانی مێگەل کە وێڕای چەندپاتە کردنەوەیە (بە شێوەی: عاعاعا) ■ حرف راندن گله

**عابا** / abaʼ/: ناو. عەبا: ١. جلپۆشێکی فشوفۆلە بڕێ پیاو بە خۆیدا دەدن ٢. چارشێوی ژنان ■ ١. عبا ٢. چادُر زنانە

**عابی** / abîʼ/: ☜ **ناوی**

**عاج** / acʼ/: ناو. ١. شانەی ئێسکئاسای بەشی ناوەوەی ددان کە مینا دایپۆشیوە ٢. خیل؛ ئاج؛ شەلفە؛ بڕە؛ بڕڕە؛ بڕۆ؛ مەرقوول؛ ماهی؛ مایی؛ شیرمایی؛ کەڵبە؛ گیرە؛ شفرە؛ شرن؛ ماکێکی ئێسقانی سپیواش، ڕەق، ڕوون و دەنک وردە کە وەک ددانێکی درێژ لە دەمی فیل، بەراز و بڕێ گیانەوەریترەوە دەردێ ■ ١و٢. عاج

**عاجبات** / ac(i)batʼ/: (!) ناو. عەجایب؛ شتی سەیر و سەمەرە ‹پیاو لەم ماڵپەڕانە عاجباتی وا دەبینێ، باسی ناکرێ!› ■ عجایب

**عاجباتی** / ac(i)batîʼ/: (!) ئاوەڵناو. سەیر و سەمەرە ‹ئەمە شتێکی عاجباتیە تۆ دەڵێی، لە کەس نەبیسراوە› ■ عجیب و غریب

**عاجز** / acizʼ/: ئاوەڵناو. عێجز؛ عێدز: ١. خەمگین؛ خەفەتبار ‹ئەو سەرە بۆچی بە دایم پڕ لە عەشقی یار نەبێ؟/ ئەو دلە بۆچی بە دایم عاجز و غەمبار نەبێ؟ «کوردی»› ٢. تووڕە؛ قەڵس ‹خوشکم ... ساتێک لە بیری نەچووم و ساڵەها بۆم گریاوە و من .. هەمیشە لەو فینگە و مینگە تووڕە و عاجز بووم! «هەژار، چێشتی مجێور»› ٣. زیز؛ تۆراو ‹تکەش عاجز کەرد خەیاڵت تێشدا/ ئازیز بەو جارێ پا بنیەر پێشدا «مەولەوی»› ٤. دەسەوەستان؛ بێدەسەڵات ‹لێم ببوورە شاعیرێکی عاجزم / مات و داماو و پەرێشان و کزم «هێمن»› * هەروەها: **عاجزی** ■ ١. غمگین ٢. عصبانی ٣. دلخور ۴. زبون

**عاجوجوماجوج** / acûc û macûcʼ/: ناو. *[کینایە]* عاجوولوماجوول؛ مندالی زۆری هاروهاج ■ بچەهای زیاد و شیطان

**عاجولوماجول** / acûl û macûlʼ/: ☜ **عاجوجوماجوج**

**عاجی** / acîʼ/: ئاوەڵناو. دروستکراو لە عاج ■

ساختەشدە از عاج

**عـادڵ / adil/'**: ئاوەڵـناو. دادگـەر؛ دادپـەروەر؛ ڕاستخواز؛ دادپرس؛ خاوەن کـردەوەی گونجـاو بەرامبەر بە داد و قانوون ☰ عادل

**عـادەت / adet/'**: نـاو. عایـەت؛ خـوو؛ خـۆ؛ خـدە؛ هووک؛ هووت؛ هڕش؛ هڕوو؛ چـاش؛ کـارێ کـە دوای پـێ فێـر بـوونی، ناویسـتەکی دووپـات دەکرێتەوە ☰ عادت

▣ **عـادەت ژنانە**: سووڕی مانگانەی ژنانە ☰ عادت ماهانە

**عادەتی گەن**: عادەتی خراپ و نـاجۆر ☰ عـادت بد

⊡ **عادەت دان**: پێ ڕاهێنان ☰ عادت دادن

**عـادەت کردن**: عـادەت گـرتن؛ خـوو گـرتن ☰ عادت کردن

**عادەت گرتن**: ☜ **عادەت کردن**

**بونە عـادەت** به شێوەی عـادەت دەرهـاتن ☰ عادت شدن

**کردنە عـادەت** به شێوەی عادەتێ زۆرتر پایەدار دەرهێنان ☰ عادت کردن

**عادەتی / adetî/'**: ئاوەڵکار. بە عـادەت؛ لـە ڕووی عادەتەوە ☰ عادتاً

**عادی / adî/'**: ئاوەڵـناو. ئاسایی؛ ئـالوە: ۱. سـازگار یان بەرامبەر لەگەڵ خوو یان نەریتدا ‹بەرنامـەی عـادی› ۲. بـێ‌هـیچ تایبەتمەندییـەکی بـەرچاو ‹قسەی عادیـمان دەکرد› ☰ ۱و۲. معمولی؛ عادی

**عار / ar/'**: نـاو. ۱. شەرم؛ شوورەیی ‹سەیدی عـار نییەن، سەیدی عـار نییـەن/ هـەر کـەس عاشـقەن نالەش عار نییەن «سەیدی»› ۲. *[کینایە]* بـن ڕان؛ ناوگەڵ ☰ ۱. عار؛ ننگ ۲. عورت

⊡ **عار داپۆشین** *[کینایە]* عەیب داپۆشین ☰ عیـب پوشیدن

**عار لێ هاتن**: پـێ عـەیب/ شـوورەیی بـوون ‹عاری لێ دێ داوای قەرز بکات› ☰ عار آمدن

**عار نان**: تەمێ بوون ☰ تنبیه شدن

**عـار نـەبـوون**: شـوورەیی نـەبوون؛ هـۆی شەرمەزاری نەبوون ‹کار کـردن عـار نییـە› ☰ عار نبودن

**عارف[1] / arif/'**: ناو. مرۆی هۆگر و شـوێنکەوتووی عیرفان ☰ عارف

**عارف[2]**: ئاوەڵـناو. خاوەن ڕوانگە و بەرچاوڕوونی ☰ عارف

**عارفانـە / ar(i)fane/'**: ئاوەڵـناو. عیرفـانی ☰ عارفانە

**عارەب / areb/'**: ☜ **عەرەب**

**عارەبانە / arebane/'**: نـاو. عەرەبانـە؛ عەڕەبانـە؛ عەڕابـە: ۱. ئارەوانـە؛ گـوهێزۆک؛ کەرەسـتەی گواسـتنەوەی چـەرخدار ۲. دەف؛ دەفـە ☰ ۱. گاری ۲. دف

**عارەبە / arebe/'**: ناو. ئـامرازی شـت گواسـتنەوە کە پێچکدارە و گا و کـەڵ دەیکێشـن ☰ گـاری کشاورزان

**عارەبی / arebî/'**: ☜ **عەرەبی**

**عـارەق / areq/'**: ناو. عەرەق؛ ئـارەق؛ عـەرەخ: ۱. خۆ؛ خۆدان؛ تراوێکی زەلاڵ و سوێر کە لە لووی ئارەقڕێژی نێو پێستی گوانداراـنەوە دەدەلـێ و لە ئاو و چەند ماکی کانی و ئـالی پێکهـاتووە ۲. هـەر تراوێکـی کرابێتـە هەڵـم و بووبێتـەوە ئـاو ‹عارەق بیمشک› ۳. خواردنەوەی ئەلکولی کە لە ترشاندن و تنۆکاندنی ئاوی میوە بەتایبەت تـرێ بەرهەم دێ ☰ ۱تا۳. عَرَق

▣ **عـارەقی خەجاڵـەتی**: عارەقـێ کـە بـە هـۆی شەرمەزارییەوە دێتە سەر پێست و بەتایبـەت تەوێڵ ☰ عرق شرم

⊡ **عـارەق بـە کەسـێ دەردان** *[کینایـە]* کەسـێ شەرمەزار کردن ☰ کسی را شرمنده کردن

**عارەق دەردان:** خۆدان دان؛ ئارەق کردن 🇮🇷 عرق بیرون زدن از تن

**عارەق ڕشتن:** ١. خۆدان دەردانی زۆر ٢. *[کینایە]* ماندوو بوون 🇮🇷 ١. عرق ریختن ٢. خسته شدن

**عارەق کردن:** عارەق دەردان 🇮🇷 عرق کردن

**عارەق گرتن:** تنۆکاندنی کولاتووی گژ و گیا (وەک: نەعنا) یان میوە و دەنکی ترشاو (وەک: تری، سێو، برنج) و بەرهەم هێنانی ئارەقیان 🇮🇷 عرق کشیدن

**عارەقاوی / 'areqawî/:** ئاوەڵناو. خۆدان دای؛ لە ئارەق گەوزاو 🇮🇷 خیس عرق

**عارەقچن / 'areqçin/:** ناو. ئارەقچین؛ ئارەخچن؛ تەقلە؛ تەقیلە؛ تاقیلە؛ عارەقگیر؛ عەرەخشە؛ جۆرێ کلاوی بێشەپکەی نیوەگۆ لە جنسی پارچە یان چنراوە 🇮🇷 عرقچین

**عارەقچین / 'areqçîn/:** ☜ **عارەقچن**

**عارەقخۆر / 'areqxor/:** ئاوەڵناو. شەراوخۆر؛ مەیخۆرە؛ مەیخۆرەوە؛ بادەخۆر. هەروەها: **عارەقخۆری** 🇮🇷 میگسار

**عارەقسەگی / 'areqsegî/:** ناو. *[پەلار]* ئارەق دەسی؛ ئارەقی تیژ و تون، بە ڕێژەیەکی زۆری ئەلکولەوە 🇮🇷 عرق سگی

**عارەقفرۆش / 'areqf(i)roş/:** ناو. شەراوفرۆش؛ فرۆشیاری هەموو جۆرە خواردنەوەی ئەلکولی 🇮🇷 میفروش

**عارەقگیر / 'areqgîr/:** ناو. ١. نەرمەزین؛ پارچە لبادی بن زین ٢. ژێرکراس؛ ژێرکراسی 🇮🇷 ١. نمد زین ٢. زیرپیراهن

**عارەو / 'arew/:** ☜ **عەرەب**

**عارەوی / 'arewî/:** ☜ **عەرەبی**

**عاریفانە / 'arîfane/:** ☜ **عیرفانی**

**عاریە / 'arye/:** ئاوەڵناو. لاهیە (بۆ ددانی دەسکرد و قژەسەری ناعەسلی دەیڵێن) 🇮🇷 مصنوعی

**عازاب / 'azab/:** ☜ **عازاو**

**عازاو / 'azaw/:** ناو. عەزاو؛ عازاب؛ عەزاب؛ عەزەبەت؛ حەزیەت؛ ڕەنج و دەرد 🇮🇷 عذاب

**عازەب / 'azeb/:** ئاوەڵناو. عازەو: ١. تازە لاوی باڵغبوو ٢. سەڵت؛ ڕەبەن؛ بێمێرد یان بێژن ‹کچی عازەب› 🇮🇷 ١. بالغ ٢. عزب؛ مُجرد

**عازەبە / 'azebe/:** ☜ **عازەبی**

**عازەبی / 'azebî/:** ناو. عازەبە؛ عازەوی: ١. جۆش؛ زیپکە؛ زیپک؛ زپک؛ زپرکە؛ پرسک؛ زفتک؛ زەک؛ جوانک؛ جوانەزۆ؛ جوانەزوە؛ جوانەزەوە؛ جوانەزمە؛ جوانەژۆ؛ تشپۆک؛ پیزۆکە؛ پیزۆک؛ پیزلووک؛ پیزەرووک؛ زیپکەی ڕووی تازەلاوان ٢. دۆخی عازەب بوون 🇮🇷 ١. جوش صورت جوانان؛ جوش غرور ٢. حالت عزب بودن

**عازەو / 'azew/:** ☜ **عازەب**

**عازەوی / 'azewî/:** ناو. ١. تازەلاوی؛ تازە پێگەیشتوویی ٢. ☜ **عازەبی** 🇮🇷 ١. بلوغ ٢. ☜ **عازەبی**

**عازیتبار / 'azyetbar/:** ☜ **ئازیەتبار**

**عازیز / 'azîz/:** ☜ **ئازیز**

**عازیەت / 'azyet/:** ☜ **ئازیەت**

**عازیەتبار / 'azyetbar/:** ☜ **ئازیەتبار**

**عاسا / 'asa/:** ناو. گۆچان؛ گۆچانە؛ گۆچەل؛ گوڕچنگ؛ گووچانگ؛ گۆپار؛ کۆپار؛ گۆپاڵ؛ قەیسک؛ کەرەستەی وەک داردەس بۆ ڕێگە چوون یان وەستان ‹عاسا، چاوی کوێرانە› 🇮🇷 عصا

**عاسابەدەست / 'asabedest/:** ئاوەڵناو. ١. عاساهەڵگرتوو ‹شەوێک شێخێکی هەموو گیان کەسکی مل بە متومووروی ڕیشسپی و عاسابەدەست بە چوار مریدەوە دابەزین، کە نەناس بوون «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. *[کینایە]* کوێر 🇮🇷 ١. عصابەدست ٢. نابینا

**عاسان / asan'/**: ☜ **ئاسان**

**عاست / ast'/**: ناو. ١. دەوروبەر؛ ئاقار ٢. ئاست؛ رووبەڕوو؛ بەرامبەر ▬ ١. دوروبر ٢. روبرو

◙ **لە عاست/ عاستی**: ١. دەرحەق بە ٢. لە بەرانبەری ▬ ١. بە نسبت؛ در حق ٢. در برابر؛ مقابلِ

**عاستەم / astem'/**: ☜ **حاستەم**

**عاستەمودووبەڵانە / astem û dûbełane'/**: ☜ **حاستەمودووبەڵا**

**عاسمان / asman'/**: ☜ **ئاسمان**

**عاسمانڕووشێن / asmanřûşên'/**: ناو. ئاسمانڕووشێن؛ عیمارەتی زۆر بڵند ▬ آسمانخراش

**عاسمانی / asmanî'/**: ☜ **ئاسمانی**

**عاسیە / as(i)ye'/**: ☜ **عاسێ**

**عاسێ[1] / asê'/**: ناو. عاسیە؛ جێگەی هەڵەمووت و سەخت ▬ گذرگاه و جای دشوارگذر

**عاسێ[2]**: ئاوەڵناو. عاسیە: ١. پێوەبوو؛ گیرکردوو ‹تا دەهاتن لە لمەکە دەچەقین و عاسێ دەبوون› ٢. سەربزێو؛ نافەرمان ‹پێشمەرگە لە دەسەلاتی بەعس عاسێ بوو› ٣. توور؛ وەڕەز؛ جاڕز ‹جاری وا هەیە منداڵ، دایک و باوکی عاسێ دەکا!› ▬ ١. درگیر ٢. سرکش ٣. عاصی

**عاشتەبا / aşteba'/**: ☜ **ئاشتەبا**

**عاشق[1] / aşiq'/**: ناو. ئاشق؛ ئاشقە؛ ئەویندار؛ ئەڤیندار؛ هەڤیندار؛ ئەڤینڤان؛ هۆگر و دڵبەستەی یەکجار زۆر بە شتێ یان کەسێک ‹عاشقی بێدڵ دەناڵێ، مەیلی گریانی هەیە/ بێشکە، هەورەتریشقە، تاوی بارانی هەیە «نالی»› ▬ عاشق

**عاشق[2]**: ئاوەڵناو. ئەویندار؛ دڵبەستە؛ بەندەوار؛ دڵدار؛ دلدار؛ دلکەتی؛ دڵداگ؛ دڵدادە؛ هەزکەر؛ ئەراگیل؛ ئەراگێل؛ بە دڵبەستەیی و هۆگری زۆرەوە، بە کەسێ یان شتێ ‹بەرامبەر شەمعی ڕووی دلداری من با پێت بڵێم چۆنە/ کەسێ عاشق دەبێ، پیاوانە وەک پەروانە سووتابێ «ئاوات»› ▬ عاشق

**عاشقانە[1] / aş(i)qane'/**: ئاوەڵناو. ئەویندارانە؛ دڵدارانە؛ وەک ئەویندران ‹نامەی عاشقانە› ▬ عاشقانه

**عاشقانە[2]**: ئاوەڵکار. ئەویندارانە؛ دڵدارانە؛ بە شێوەی ئەویندران ‹عاشقانە دەنووسێ› ▬ عاشقانه

**عاشقباش / aşiqbaş'/**: ناو. نەخۆشییەکی یەکسم ▬ نوعی بیماری ستور

**عاشقبەند / aşiqbend'/**: ناو. زنجیر و زەمبەرێکە بۆ سەر سینگی ژنان ▬ از زیورآلات زنان

**عاشقی / aş(i)qî'/**: ناو. ئەوینداری؛ دڵداری؛ دۆخ یان چۆنیەتی عاشق بوون ‹برسییەتیت نەکێشاوە، عاشقیت لە بیر بچێتەوە! «مەسەل»› ▬ عاشقی

**عاشوورا / aşûra'/**: ناو. ڕۆژی دەهەمی مانگی موحەڕەم لە ساڵی مانگیدا ▬ عاشورا

**عاشیرەت / aşîret'/**: ناو. ١. خێڵ؛ تیرە؛ هۆز ‹سەرۆک عاشیرەت› ٢. ئاشیرەت؛ هێما؛ کاری بە دەست یان بە چاو نیشان کردن ▬ ١. عشیرت ٢. ایما؛ اشاره

**عاعا / a'a'/**: ☜ **عەعە**

**عاعالێ / a'alê'/**: ناو. *[منداڵانە]* بزن ▬ بُز

**عافراندن / afr(i)randin'/**: ☜ **ئافراندن**

**عافرەت / afret'/**: ☜ **ئافرەت**

**عافوات / afwat'/**: ناو. کاری بەخشینی تاوانباران لە لای دەوڵەتەوە ▬ عفو عمومی

**عافوو / afû'/**: ☜ **عەفوو**

**عافیەت / af(i)yet'/**: دۆعا. ١. نۆشی گیان (وشەیەکە کاتێ دەگوترێ کەسێ تراوێ، بەتایبەت ئاو، بخواتەوە) ٢. بە سەلامەتی (کاتی پژمین، حەمام کردن و شتی وا دەگوترێ) ▬ ١. نوش جان

۲. عافیت

**عاق** / aq/': ناو. شیرحەرام؛ ئەوی بێفەرمانیی دایک و بابی دەکا، بەر تووک و نفرینیان دەکەوێ و لە میراتیان بێبەش دەبێ ☰ عاق

**عاقشقە** / aqişqe/': ناو. پەنجەرەی دوودەری ☰ پنجرەی دوتایی

**عاقڵ** / aqiɫ/': ئاوەڵناو. ژیر؛ بەئاوەز؛ ئاقڵ ‹عاقل بە ئیشارە، نەزان بە نەقیزە «مەسەل»› ☰ عاقل

▣ **عاقڵ بوون**: ژیر بوون: ۱. خاوەن عەقڵ بوون ۲. *[کینایە]* تەمێ بوون. هەروەها: **عاقڵ کردن** ☰ ۱. عاقل شدن ۲. تنبیه شدن

**عاقڵانە**[1] / aq(i)ɫane/': ئاوەڵناو. ئاقڵانە؛ ژیرانە؛ سازگار لەگەڵ عەقڵ ‹قسەی عاقڵانە› ☰ عاقلانه

**عاقڵانە**[2]: ئاوەڵکار. ئاقڵانە؛ ژیرانە؛ بە شێوەیەکی سازگار لەگەڵ عەقڵدا ‹عاقڵانە قسەی کرد› ☰ عاقلانه

**عاقڵی** / aq(i)ɫî/': ناو. ژیری؛ بار و دۆخی عاقڵ بوون ☰ عاقلی

**عاقیبەت**[1] / aqîbet/': ناو. دوماهی؛ سەرەنجام ‹ئەم کارە عاقیبەتی چ دەبێ، کەس نازانێ› ☰ عاقبت

▣ **عاقیبەت نەبوون**: ئاخر و دواڕۆژی باش نەبوون؛ ئاخر شەڕ بوون ‹ئەم کارانە عاقیبەتی نییە!› ☰ عاقبت نداشتن

**عاقیبەت**[2]: ئاوەڵکار. ئاخری؛ دواجار؛ لە ئاکامدا؛ سەرەنجام ‹عاقیبەت سەردەکەوین› ☰ عاقبت

**عاقیبەتبەخێر** / aqîbetbexêr/': ئاوەڵناو. ئاخرچاک؛ بە ئاکام و داهاتوویەکی باش و بەختەوەرەوە ‹رۆڵە عاقیبەتبەخێر بی!› ☰ عاقبت‌بەخیر

**عاگول** / agul/': ☜ عەگوڵ

**عال** / al/': ☜ عالی

**عالا** / ala/': ☜ ئالا-۱

**عالم**[1] / alim/': ناو. مامۆستا: ۱. زانا؛ زانیار ۲. مەلا؛ زانای دینی موسڵمان ☰ ۱. دانشمند ۲. آخوند

**عالم**[2]: ئاوەڵناو. زانا؛ هۆزان ☰ عالم

**عالوسال** / alusal/': ناو. پشوولەسەرخۆیی؛ مەندی ☰ شکیبایی

**عالەم** / alem/': ناو. ئالەم؛ عالەم: ۱. خەڵک؛ مەردم ‹عالەم دەزانێ› ۲. جیهان ‹وتم: ئەم عالەمە دڵیان ئەسیری غەمزەتە، بەس بێ/ وتی: کەی بۆتە قووتی شاهبازێ پڕ بە کەف خەردەل؟! «مەحوی»› ☰ ۱. مردم ۲. جهان؛ عالم

**عالەمیان** / alemyan/': ناو. دوو جیهان؛ دنیا و پەسڵان ☰ دنیا و آخرت

**عالی** / alî/': ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. عال؛ زۆر باش؛ فرە خاس ☰ عالی

**عاڵەم** / aɫem/': ☜ عالەم

**عام** / am/': ئاوەڵناو. هەمووانی؛ گشتی؛ تێکڕایی ☰ همگانی

▣ **بەعام**: گش‌لەگش؛ تێکڕا؛ تەواوی ‹خەڵکی بەعام بەشدارییان کرد› ☰ همگی

**عاماردار** / amardar/': ناو. کۆگەوان ☰ انباردار

**عامامە** / amame/': ☜ عەمامە

**عامباز** / ambaz/': ☜ ئامباز

**عامفام** / amfam/': ناو. ۱. کاری جاڕ کێشان بە ناو خەڵکدا؛ کاری ڕاگەیاندنی خەبەر بە گشت مەردم ۲. کار و ڕەوتی تێگەیاندنی بابەتێ ☰ ۱. جار ۲. تفهیم

▣ **عامفام کردن**: حاڵی کردن؛ تێگەیاندن. هەروەها: **عامفام بوون** ☰ تفهیم کردن

**عاملان** / am(i)lan/': چاوگ. ڕاهاتن؛ فێر بوون ☰ آموزش دیدن؛ آموختن

**عاملاندن** / am(i)landin/': چاوگ. ۱. ڕاهێنان؛ فێر کردن ۲. بەخێو کردن ☰ ۱. تعلیم دادن ۲.

پرورش دادن

**عاملاو** / 'am(i)law/: ئاوەڵناو. ڕاهێندراو؛ فێرکراو ⚑ تعلیم‌دیده

**عان** / 'an/: ناو. کات؛ وەخت؛ دەم ⚑ آن؛ دم

**عانە** / 'ane/: ناو. ١. دراوێکی هیندوستانە ٢. /کینایه/ پوول و پارە؛ ماڵ و سامان ‹گەرچی دڵداری لە خاکی ئێمەدا ئەفسانەیە/ هەر بە تەنیا بۆ کوڕی خاوەن‌تەلار و عانەیە «هەردی»› ⚑ ١. آنه؛ واحد پول هندی ٢. ثروت

**عایل** / 'ayil/: ئاوەڵناو. زاڵم؛ ناهەق ⚑ ستمکار

**عایلەمەن**[1] / 'aylemen/: ☚ عاینەمەل

**عایلەمەن**[2]: ئاوەڵناو. خێزاندار؛ خێزانبار؛ مناڵبار ⚑ عیالوار

**عاینەمەل** / 'aynemel/: ناو. عایلەمەن؛ عەیلەمەن؛ عەینەمەل؛ خەزایی ⚑ سار صورتی

**عایەت** / 'ayet/: ☚ عادەت

**عایەر** / 'ayer/: ئاوەڵناو. گزیکار؛ فێڵباز؛ گەڕباز ⚑ حیله‌گر

**عجایب** / '(i)cayib/: ئاوەڵناو. سۆبەت؛ سەیر؛ سەمەرە ⚑ شگفت

**عجۆل** / '(i)col/: ناو. تووکەسەری قرژ و شێواو ⚑ موی سر کم پشت و ژولیده

**عرک** / 'irk/: ناو. ورگ؛ ئەشقەمە؛ عویر؛ حویر؛ سەخور؛ جێگەی ڕیخۆڵە لە زگدا ⚑ اشکمبه

**عرم** / 'irm/: ☚ عور

**عشتر** / 'iştir/: ☚ وشتر

**عشک** / 'işk/: ئاوەڵناو. وشک؛ هیشک ⚑ خُشک

**عفونەت** / '(i)fûnet/: ناو. عەفوونەت: ١. چڵک؛ چرک؛ کێم؛ زووخ؛ زینجکاو یان برینێ کە لە هۆکارەکانی نەخۆشیزاوە بەدی‌دێت ٢. کفکۆ؛ بۆگەن؛ بۆسار ٣. /پزیشکی/ تەشەنا؛ ڕەوتی تێچوون، بڵاوە بوون و گەشە کردنی میکرۆب و مشەخۆر لە برین یا ئەندامێکی زیندوو (میواندار) ⚑ ١تا٣. عفونت

⊡ **عفونەت کردن**: تەشەنا کردن/ سەندن؛ پەرە سەندنی عفوونەت لە ئەندام یان ئەندامەکانی لەش ⚑ عفونت کردن

**علعول** / 'il'ûl/: ئاوەڵناو. عولعوول؛ نەرم و لووس لە ناو دەستا ⚑ نرم و لیز در دست

**عمر** / 'im(i)r/: ناو. عومر؛ تەمەن ⚑ عُمر

**عنرین** / 'inrîn/: چاوگ. عەنرین؛ عنگرین؛ عێنگرین؛ ئەنگژین؛ توورە بوون؛ ڕق هەستان ⚑ خشمگین شدن

**عنگرین** / 'ng(i)rîn/: ☚ عنرین

**عننە** / 'inne/: ناو. /شوورەیی/ کونی قوون ‹ئەجۆ هێلە بەنگیانەنە عننەش «مەسەل»› ⚑ مقعد

**عنەوەنەوزە** / '(i)newenewze/: ☚ قنگەخەو

**عور** / 'ur/: ناو. ئاشک؛ هێلگ؛ هورگ ⚑ شکمبه

**عورزە** / 'urze/: ناو. شیاوی؛ لێهاتوویی ⚑ عُرضه

⊡ **عورزە هەبوون**: عورزەدار بوون؛ لێهاتن؛ لێهاتوو بوون ⚑ عُرضه داشتن

**عورزەدار** / 'urzedar/: ئاوەڵناو. باعورزە؛ لێهاتوو ⚑ باعُرضه

**عورف** / 'urf/: ناو. ١. داب و نەریتی گشتی؛ ڕێ‌وشوێنی گشتی ٢. پیت؛ حەرف ‹بە هەر سێ عورفی کەلامەلایە› ⚑ ١. عُرف ٢. حرف الفبا

**عورگ** / 'urg/: ☚ ورگ

**عورووسی** / 'urûsî/: ناو. ئورووسی؛ ڕەوانی؛ جۆرێ پەنجەرەی چێوی بە شیشەی ڕەنگاوڕەنگ و چکۆلەوە، کە هەڵدەدرێتەوە ⚑ پنجرەی اُرُسی

**عوزر** / 'uz(i)r/: ناو. ١. بێ‌نوێژی؛ عادەتی ژنانە ٢. بیانوو؛ بیانک ٣. لێ‌بووردانە؛ داوای لێ‌بووردن ⚑ ١. حیض ٢. بهانه ٣. معذرت

⊡ **عوزر خواستن**: داوای لێ‌بووردن کردن ‹ئەگەر کەم‌وکوورییەک هەیە عوزر ئەخوازم› ⚑ عُذر خواستن

**عوزر شتن:** پا بوونەوە لە عادەتی ژنانە 🇮🇷 از حیض در آمدن

**عوزر هێنانەوە:** ١. بیانوو هێنانەوە ‹لە دەوری خالەکەی کولمی کە ماری زولفی داناوە / لە سەر تەسویرەکەی ئادەم مەلەک سەد عوزری هێناوە «حاجی قادر»› ٢. عوزرمایی کردن؛ داوای لێبووردن کردن 🇮🇷 ١. عُذر آوردن ٢. عُذرخواهی کردن

**عوزرخوازی / 'uz(i)rx(i)wazî/:** ☜ **عوزرمایی**

**عوزرخوایی / 'uz(i)rx(i)wayî/:** ☜ **عوزرمایی**

**عوزرشۆر / 'uz(i)rşor/:** ئاوەڵناو. *[کینایە]* سەروعوزرشۆر؛ پێگەیشتوو (بۆ ژن) 🇮🇷 بالغ (زن)

**عوزرمایی / 'uz(i)rmayî/:** ناو. عوزرخوایی؛ عوزرخوازی؛ داوای لێبووردن. هەروەها: **عوزرمایی هاوردنەوە/ هێنانەوە** 🇮🇷 عُذرخواهی

**عوزرنەشۆر / 'uz(i)rneşor/:** ئاوەڵناو. *[کینایە]* هێشا پێنەگەیشتوو (بۆ ژن) 🇮🇷 نابالغ (زن)

**عوزم / 'uzm/:** ناو. سەنگینی و پشوولەسەرخۆیی 🇮🇷 وقار

**عوسڵ / 'usł/:** ☜ **غوسڵ**

**عوشاقی / 'uşaqî/:** ناو. جۆرێ ترێ 🇮🇷 نوعی انگور

**عول / 'ul/:** ئاوەڵناو. خێل؛ خوێل 🇮🇷 لوچ

**عولعول / 'ul'ûl/:** ☜ **علعول**

**عومدە / 'umde/:** ئاوەڵناو. زەبەند؛ بۆش؛ بەکۆ؛ کۆ؛ کۆم؛ بە چەند و چۆنییەکی زۆرەوە 🇮🇷 عُمده

**عومدەفرۆش / 'umdef(i)roş/:** ناو. کۆمفرۆش؛ کۆفرۆش؛ بازرگانێ کە بە تێکڕایی ماڵ بە بازرگانی پچووکتر دەفرۆشێ. هەروەها: **عومدەفرۆشی** 🇮🇷 عُمدەفروش

**عومر / 'um(i)r/:** ناو. تەمەن؛ ماوەی ژیان 🇮🇷 عُمر؛ سن

◻ **عومر کردن:** ☜ **عەمر کردن ـ١**

**عومردرێژ / 'um(i)rd(i)rêj/:** ☜ **عەمردرێژ**

**عومرە / 'umre/:** ناو. عەمرە: ١. سەرجەمی ئەو کارانە کە حاجییان لە حەجدا دەیکەن (وەک: بەستنی ئیحرام، تەواف، ڕەفتی سەفا و مەروە و سەرتاشین) ٢. حەج نەک لە کاتی خۆیدا 🇮🇷 ١و٢. عُمره

**عویر / '(i)wîr/:** ☜ **عور**

**عویرگ / '(i)wîrig/:** ☜ **عور**

**عۆ / 'o/:** دەنگ. دەنگێ کە بۆ ئابڕوو بردن و قاودانی کەسێ دەریدێنن 🇮🇷 صدایی کە هنگام تمسخر و هَو کردن کسی درآورند

◻ **عۆ لێ کردن:** قاڵ لێ کردن؛ حەیا بردن 🇮🇷 هَو کردن

**عۆدە / 'ode/:** ناو. ئەستۆ؛ پا؛ سەر؛ مل ‹ئەو کارە لە عۆدەی منە› 🇮🇷 عُهده

**عۆدەی / 'odey/:** پێت. لەسەر؛ لەپای 🇮🇷 عُهدەی

**عۆین / 'oy(i)n/:** ناو. ١. فێڵ و گزی ٢. ئەداوئەتواری نەگونجاو و گاڵتەجاڕ. هەروها: **عۆین دەرهێنان** 🇮🇷 ١. حیله ٢. ادا و اطوار مسخره

**عووج / 'ûc/:** ناو. حووج؛ درێژی دیرۆکان 🇮🇷 عوج

**عوور / 'ûr/:** ناو. عویر؛ عویرگ؛ عوورگ؛ عوویر؛ حویر؛ ورگ؛ عرم 🇮🇷 شکمبه

**عوورگ / 'ûrig/:** ☜ **عور**

**عوورمەزن / 'ûrmez(i)n/:** ناو. ورگن؛ زگزل 🇮🇷 شکم‌گنده

**عوورە / 'ûre/:** ناو. خۆیانی کوتراوی ئامادەی شەن کردن 🇮🇷 خرمن کوبیدەی آمادەی باد دادن

**عوورین / 'ûrîn/:** چاوگ. دەنگ کردنی گامێش 🇮🇷 صدا درآوردن گاومیش

**عوو ـ عوو / 'û 'û/:** ناو. *[باوەری کۆن]* بوونەوەری خەیاڵی منداڵترسێن ‹ژێر بە! عوو ـ عوو دێت دەتخوا!› 🇮🇷 موجود خیالی بچەترسان

**عوون / 'ûn/:** ناو. *[شوورەیی]* قوون؛ قنگ 🇮🇷 باسن

**عوویر / 'ûyr/:** ☜ **عور**

**عه** / 'e/: ☜ عا

**عه‌با** / 'eba/: ☜ عابا

**عه‌بد** / 'ebd/: ناو. کۆیله؛ به‌نی ☰ عبد؛ بنده

**عه‌بدال**[1] / 'ebdal/: ناو. عه‌بدال؛ ناوده‌ڵ؛ نێره‌پۆڕ ☰ دُرّاج نر

**عه‌بدال**[2]: ☜ عه‌وداڵ

**عه‌بداڵ**[1] / 'ebdał/: ☜ عه‌بدال[1]

**عه‌بداڵ**[2]: ☜ عه‌وداڵ

**عه‌برەش** / 'ebreş/: ئاوه‌ڵناو. ١. که‌مشیر (ئاژه‌ڵ) ٢. تاڵه‌ی نێو چاوان سپی (مه‌ڕ) ☰ ١. کم‌شیر (دام) ٢. سیاهِ پیشانیٔ سفید (گوسفند)

**عه‌بله‌خه‌رج** / 'eblexerc/: ئاوه‌ڵناو. هه‌ڵه‌خه‌رج؛ ده‌سبا ☰ ولخرج

**عه‌بوری** / 'ebûrî/: ناو. پارچه‌یه‌کی ئاوریشمه بۆ پێچه‌سه‌ر ☰ نوعی پارچه‌ی ابریشمی برای دستار

**عه‌بوس** / 'ebûs/: ئاوه‌ڵناو. ناوچاوتاڵ؛ ڕووگرژ ☰ اخمو؛ عبوس

**عه‌به‌سان** / 'ebesan/: ☜ حه‌په‌سان

**عه‌به‌سران** / 'ebesran/: ☜ حه‌په‌سان

**عه‌به‌نوس** / 'ebenûs/: ناو. حه‌په‌نووس؛ دار ئاوه‌نووس؛ دار ئه‌بانووس؛ دار ئه‌بنووس؛ دارێکی ڕه‌ش و ڕه‌قی به‌نرخه و بۆ نازککاری به‌کار دێ ☰ آبنوس

**عه‌بیر** / 'ebîr/: ناو. ماکی بۆنخۆش له میسک، گوڵاو، سه‌نده‌ل، زافه‌ران و ... ☰ عبیر

**عه‌په‌سان** / 'epesan/: ☜ حه‌په‌سان

**عه‌تار** / 'etar/: ناو. ئه‌وی به‌هارات، دا و ده‌رمانی گیایی، تووی گوڵ و گیا و شتی وا ده‌فرۆشێ ☰ عطّار

**عه‌تاری** / 'etarî/: ناو. عه‌تاری: ١. دووکانێک که گژ و گیای ده‌رمانی و به‌هارات و تووی گوڵ و... تێدا ده‌فرۆشن ٢. پیشه‌ی عه‌تار ☰ ١و٢. عطّاری

**عه‌تر** / 'et(i)r/: ناو. ١. به‌رامه؛ بۆنخۆشی؛ بۆنی خۆش ‹عه‌تری گوڵان› ٢. گوڵاو؛ گوڵاف؛ له‌وه‌نته؛ تراوێکی بۆنخۆش که له ماکی سروشتی (وه‌ک گوڵ و گیا و ...) یان تێکه‌ڵاوێک که له ئه‌سانس و گیراوه‌ی کیمیایی دروست ده‌کرێت ☰ ١و٢. عطر

**عه‌تراژن** / 'et(i)rajin/: ئاوه‌ڵناو. به عه‌تر ئاژنراو؛ زۆر عه‌تراوی ‹باخه‌که له بۆنی گوڵان عه‌تراژن بوو› ☰ عطرآگین

**عه‌تراوی** / 'et(i)rawî/: ئاوه‌ڵناو. ١. به عه‌تره‌وه تلاو؛ عه‌تر لێ دراو ٢. بۆنخۆش ☰ ١. عطری ٢. خوشبو

**عه‌ترپژێن** / 'et(i)rp(i)jên/: ناو. تونگی گچکه‌ی جێ هه‌تر به کورته‌شله‌نگ و تورومپایه‌که‌وه، بۆ پژاندنی عه‌تر ☰ عطرپاش

**عه‌ترچایی** / 'et(i)rçayî/: ناو. ١. جۆرێ گوڵی گه‌ڵاپه‌نجه‌یی بۆنخۆشه له گوڵداندا په‌روه‌رده ده‌کرێ ٢. گه‌ڵای وردکراوی ئه‌و گوڵه که هه‌ر له گوێنی چاییه و بۆ تام و بۆن پێ دان، تێکه‌ڵی چایی ده‌که‌ن ☰ ١و٢. عطر چای

**عه‌ترەش** / 'etreş/: ناو. زاڵه؛ زاور ☰ زهره

▣ **عه‌ترەش په‌ڕین**: زاڵه‌تره‌ک بوون؛ تۆقین ☰ زهره‌ترک شدن

**عه‌تره‌نگی** / 'etrengî/: ناو. چێره‌یی؛ ڕه‌نگی سووری کاڵ ☰ صورتی

**عه‌تفک** / 'etfik/: ناو. زه‌نگه‌ته؛ تلیسک؛ تیسک؛ قرتاڵیک له هێشوو ☰ تلسک

**عه‌ته** / 'ete/: ناو. میمک؛ میمی؛ مه‌تی؛ پلک؛ پله؛ خوشکی باوک ☰ عمّه

**عه‌ته‌ب** / 'eteb/: ناو. ڕخنه؛ به‌زافیت ☰ نقد

**عه‌تیقه**[1] / 'etîqe/: ناو. که‌ونینه؛ که‌ل‌وپه‌لی که‌ونارا ☰ عتیقه

**عه‌تیقه**[2]: ئاوه‌ڵناو. ١. ئه‌نتیکه؛ که‌ونارا؛ دێرسی ٢.

[پلار] کۆن؛ کۆنە ‹ئەم ماشینە عەتیقە چییە سەندووتە؟!› ١. عتیقه ٢. قدیمی

**عەجایب / ecayib/'**: ئاوەڵناو. سەیر؛ سەمەرە ‹عەجایب بەهرەیەک بوو خوا کە دای بەم قەومی کوردانە / شەوی دەیجووری لێ لاچوو، جەهالەت وا لە فەوتانە «بێکەس»› عجیب

**عەجمان / ecman/'**: ناو. حەجمان؛ ئۆقرە آرام و قرار

**عەجنە / ec(i)ne/'**: ناو. جنۆکە؛ ئەجنە؛ جندۆکە؛ جن جن

**عەجەب[1] / eceb/'**: ئاوەڵناو. عەجەو؛ سەیر؛ سەمەرە عجیب

**عەجەب[2] / eceb/'**: ئاوەڵکار. عەجەو؛ سەیرە؛ سەمەرەیە ‹عەجەب ئەستێرە شەو هەڵدێ لە تاوی خوسرەوی خاوەر/ بە ڕووی تۆم دیدە هەڵنایێ شەو و ڕۆژ ئەرچی بیدارم «نالی»› شگفتا

**عەجەل / ecel/'**: ناو. ئەجەل؛ ئاکام؛ دەمی مەرگ اجل

**عەجەلە / ecele/'**: ناو. پەلە؛ لەز عجله

**عەجەم / ecem/'**: ناو. ١. فارسی ئێرانی ٢. غەیری عەرەب؛ ناعەرەب ٣. غەیری کورد ١. فارس ایرانی ٢. غیر عرب ٣. غیر کُرد

**عەجەمی[1] / ecemî/'**: ناو. ساتۆری کەبابچی ساطور کباب‌پز

**عەجەمی[2]**: ئاوەڵناو. خەڵکی وڵاتی ئێران، بێجگە کورد ایرانی، به استثنای کُرد

**عەجەو / ecew/'**: ☜ عەجەب

**عەجیب / ecîb/'**: ئاوەڵناو. سەیر و هەژەند عجیب

**عەداب / edab/'**: ☜ عەزاب ـ١

**عەدالە / edale/'**: ناو. کەحێل؛ ئەسپی ڕەسەنی عەرەبی نەژاد اسب نجیب عربی

**عەداڵەت / edałet/'**: ناو. دادگەری؛ دادپەروەری عدالت

**عەداوەت / edawet/'**: ناو. دوژمنی؛ دوژمنایەتی عداوت؛ دشمنی

**عەدر / edr/'**: ناو. عەدرۆیی؛ فێ؛ پەرکەم؛ خووداری؛ نەخۆشی فێداری صرع

**عەدرۆ / edro/'**: ئاوەڵناو. خوودار؛ سادار؛ فێدار؛ تووشیاری فێ صرعی؛ غَشی

**عەدرۆیی / edroyî/'**: ☜ عەدر

**عەدوسەد / ed û sed/'**: ناو. عەدەعەد؛ جەنگە؛ هەڕەت ‹عەدوسەدی سەرهەڵدانی ڕێواسە› موسم؛ وقت

**عەدەب / edeb/'**: ناو. ١. شەرم و حەیا ٢. [کینایە] ناوگەڵ؛ بن ڕان ‹عەدەبت داپۆشە!› ١. حیا ٢. میان هردو ران

**عەدەعەد / ede'ed/'**: ☜ عەدوسەد

**عەدیاڵ / edyał/'**: ناو. بەتانی؛ بەتانیە؛ پەتوو پتو

**عەراف / eraf/'**: ئاوەڵناو. ١. درۆزن؛ فیشاڵباز ٢. زۆربلێ؛ فرەبێژ ١. دروغگو ٢. وراج

**عەربە / erbe/'**: ناو. عەلبە؛ کێشانەی دەخڵ بەرانبەر بە ٢٥٦ کیلۆ پیمانه‌ای برابر ۲۵۶ کیلو غله

**عەرد / erd/'**: ☜ عەرز ـ١

**عەردانێ / erdanê/'**: ناو. زۆران؛ زۆرەبانێ کُشتی

**عەرز / erz/'**: ناو. ١. عەرد؛ زەمین ‹ئەوە عەرز و ئەوەش گەز! «مەسەل»› ٢. شەرەف؛ ئابڕوو ٣. وتە؛ قسە؛ کار و ڕەوتی گوتن؛ ڕاگەیاندن ‹سەرعێل عەرزم هەن لا بکەرەوە!/ خێڵخانەی دلان ها لە بەرەوە «مەولەوی»› ١. زمین ٢. شرف ٣. عرض

▣ **عەرز پێ تەنگ بون**: [کینایە] گیر نەبوون لە شوێنێکدا؛ دنیا لێ بوونە چەرمی چۆلەکە

عرصه بر کسی تنگ شدن

**عەرز پێوان:** ١. ڕێگە چوون ٢. ئەندازە گرتنی زەوی ☰ ١. راه پیمودن ٢. مساحی کردن

**عەرز کردن:** وتن (بۆ ڕێز دانان) ☰ عرض کردن

**عەرز لەرزین:** زەوی لەرزین ☰ زمین لرزیدن

**لە عەرز دان:** بە زەویدا دان؛ کوتانە زەویدا ☰ زمین زدن

**عەرزوحاڵ / 'erz û ĥał/:** ☜ **عەریزە**

**عەرز و عاسمان / 'erz û 'as(i)man/:** ناو. *[کینایە]* دنیا و هەرچی تێدایە ‹دلم چووبووە سەر کیژێک کە عەرز و عاسمانی لە بیر بردبوومەوە! «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ دنیا و مافیها

**عەرزێل / 'erzêl/:** ناو. پێڕک؛ ستێڕ؛ ئەستێرک ☰ جای اثاثیه در سیاه چادر

**عەرش / 'erş/:** ناو. ١. قـورش؛ ئـەخش؛ کەشکەلان؛ تەشق؛ بەرزایی ئاسمان ٢. *[کینایە]* تەختی خوا لە ئاسمان ☰ ١. عرش ٢. عرش خُدا

**عەرعەر[1] / 'er'er/:** ☜ **عەڕعەڕ**

**عەرعەر[2]:** ئاوەڵناو. *[کینایە]* بلند؛ بلیند؛ بەرز ‹باش نازدارانی، سۆسەن خالانی/ قامەت نەونەمام، عەرعەر بالانی «سەیدی»› ☰ بلند

**عەروز / 'erûz/:** ناو. تـەرازووی هەڵبەست؛ بنـەمای کێشـی شـیعر لـە شـیعری کلاسـیکی ولاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ☰ عَروض

**عەرەب / 'ereb/:** ناو. عـارەب؛ عـارەو؛ عـەرەو؛ عەڕەب؛ تاتکی؛ تات: ١. هۆزێکی گەورەی سپی پێسـتی سـامی، لـە دانیشـتوانی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاست ٢. هەر یەکە لە کەسانی ئەو هۆزە ☰ ١و٢. عرب

**عەرەبانە / 'erebane/:** ☜ **عارەبانە**

**عەرەبوون / 'erebûn/:** ناو. پێشەکی؛ بێع؛ بەیعانە ☰ بیعانە

**عەرەبی[1] / 'erebî/:** ناو. عـارەبی؛ عـارەوی؛ لـە زمانەکانی سامی-حامی کـە خەڵـکێکی زۆر لـە ولاتـانی ڕۆژهـەڵاتی نزیـک و بـاکووری ئافریقـا قسەی پێ دەکەن ☰ عربی

**عەرەبی[2]:** ئاوەڵناو. عـارەبی؛ عـارەوی؛ سـەر بـە عەرەب ‹هەڵپەڕکێ عەرەبی› ☰ عربی

**عەرەخ / 'erex/:** ☜ **عارەق**

**عەرەفە / 'erefe/:** ناو. ڕۆژی پێش جێژنی قوربان؛ ڕۆژی نۆیەمی مانگی زیحەجە ☰ روز عرفه

**عەرەق / 'ereq/:** ☜ **عارەق**

**عەرەو / 'erew/:** ☜ **عەرەب**

**عەریزە / 'erîze/:** ناو. عەرز و حاڵ؛ شـکایەتنامە ☰ عریضه

**عەریف / 'erîf/:** ناو. ١. بێگانە کـە حـەز لـە ژنی کەسێک دەکا ٢. حەریف؛ هاوکێشە؛ هەڤبەر ☰ ١. فاسق زن شوهردار ٢. حریف

**عەڕابە / 'eřabe/:** ☜ **عارەبانە**

**عەڕعەڕ / 'eř'eř/:** ناو. عەرعـەر؛ هـەورس؛ هـەوریس؛ هـەورێس؛ هەڤـریس؛ هەڤریسـک؛ هاڤرسک؛ هەوێس؛ ئیرڤست؛ هێرڤست؛ وەهـل؛ ئەرز؛ مەرخ؛ دارێکی بەرزە لە تیرەی سماق بـە گەڵای پان، گوڵی تەکووز و جـەوگی بۆگەنـەوە، چێوەکەی لە دارتاشیدا بە کەڵک دێ ☰ درخت عرعر

**عەڕن / 'eř(i)n/:** ناو. دڵناسـکی؛ ناسکدڵـی ☰ دلنازُکی

**عەڕنۆک / 'eřnok/:** ئاوەڵناو. بـێحەوسـەڵە؛ پشووتەنگ؛ کەمدڵ ☰ زودرنج

**عەڕە / 'eře/:** دەنگـەناو. زەڕە؛ سـەڕە؛ دەنگـی بڵندی کەر ☰ عرعر الاغ

**عەڕەب / 'eřeb/:** ☜ **عەرەب**

**عەڕەبانە / 'eřebane/:** ☜ **عارەبانە**

**عەڕەخشە / 'eřexşe/:** ☜ **عارەقچن**

**عەز / 'ez/:** ناو. حەز؛ تاسە؛ ئارەزوو ☰ اشتیاق

▣ **عەز لێ کردن**: ١. خۆش ویستنی ئەویندارانە ٢. ویستن؛ خوازتن؛ تواسن ☰ ١. محبت عاشقانه ٢. طلب کردن

**عەزاب / ezab'/**: ناو. ١. عەداب؛ کێم و زووخاوی دمەڵ ٢. ☜ عازاو ☰ ١. چرک دُمل ٢. ☜ عازاو

**عەزازیل / ezazîl'/**: ناو. شەیتان ‹سەنەما سور ژ سەمەد شەوقێ ژ حەق دایە وجوودێ/ گەر عەزازیل بدیتا نەدبر غەیرێ سجوودێ «مەلای جزیری»› ☰ شیطان

**عەزاو / ezaw'/**: ☜ عازاو

**عەزرەبات / ezrebat'/**: ناو. ئاشتەبا؛ شت ‹زۆر دەسکورتە، عەزرەباتی خودا شک نابا› ☰ متاع

**عەزرەت / ezret'/**: ناو. ١. سۆ؛ سوێ؛ تاسە؛ ئارەزوو بۆ شتێ کە لە بەر دەست نییە ‹وێڵم و تاریکە دەورم، فەرشی ڕێگەم مەینەتە/ بێکەسم، تەنیا ئەناڵم، مەرگی خۆمم عەزرەتە «هەردی»› ٢. داخ؛ خەفەت؛ ئاواتی بەدی نەهاتوو ‹هەر ئەوەندەم توانی لە دەرفەتێکدا نیو دەقیقەیەک بیبینم و داخ و عەزرەت بە یەکتر بگۆڕینەوە «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ ١. آرزو ٢. حسرت

**عەزرەتی / ezretî'/**: ئاوەڵناو. کەلیلان؛ زۆر بە تاسە ☰ بسیار مُشتاق

**عەزم / ezm'/**: ناو. هەرسک؛ هەزم؛ هەرس ☰ هضم

**عەزمان / ezman'/**: ☜ ئاسمان

**عەزماندن / ezmandin'/**: ☜ عەزمین

**عەزمین / ezmîn'/**: چاوگ. عەزماندن؛ بانگهێشتن بۆ میوانی ☰ دعوت کردن به مهمانی

**عەزوا / ezwa'/**: ☜ ئەزوا

**عەزەبەت / ezebet'/**: ناو. عازاو؛ عەزاو؛ عەزاب ☰ عذاب

**عەزەمەت / ezemet'/**: ناو. گەورەیی؛ بەشکۆیی ‹عەزەمەت بۆ خوایە› ☰ عظمت

**عەزیا / ezya'/**: ناو. زەها؛ حەزیا ☰ اژدها

**عەزیز / ezîz'/**: ئاوەڵناو. ١. خۆشەویست؛ خوەشەویس؛ بەقەدر ٢. چاک؛ باش؛ ئاکارچاک ‹کوڕە گەورەکەیان فرە عەزیزە› ☰ ١. عزیز؛ گرامی ٢. باالخلاق

**عەزیزمردە / ezîzmirde'/**: ئاوەڵناو. خۆشەویست مردوو ☰ عزیزمُرده

**عەزیزی / ezîzî'/**: ناو. ١. دیڤداشە؛ کراسی ئاودامێن بۆ شەوانە ٢. خۆشەویستی؛ خوەشەویسی ☰ ١. پیراهن بلند شبخواب ٢. عزیزی

**عەزیەت / ezyet'/**: ناو. ئازار؛ عازاب؛ عازاو ☰ آزار

**عەسپ / esp'/**: ناو. ئەسپ؛ هەسپ ☰ اسب

**عەسر / es(i)r'/**: ناو. ١. دوای نیوەڕۆ؛ نێوان نیمەڕۆ و ئێوارە ٢. پەلپ؛ گرووی منداڵ ٣. سەردەم؛ دەوران ☰ ١. عصر ٢. بهانەگیری بچه ٣. دوران

**عەسران / esran'/**: ناو. دوای نیوەڕۆیان ☰ بعدازظهر

**عەسرانە / esrane'/**: ☜ عەسرۆژە

**عەسرۆژە / esroje'/**: ناو. ژەمەخوێڕی؛ عەسرانە؛ عەسرە؛ هەنگۆرانە؛ خواردنی سەرلە ئێوارە ☰ عصرانه

**عەسرە / esre'/**: ☜ عەسرۆژە

**عەسرین / esrîn'/**: چاوگ. گروو گرتن؛ ژیر نەبوونەوە؛ گریان و بیانوو گرتنی منداڵ ☰ گریه کردن و بهانه گرفتن بچه

**عەسعەس / es'es'/**: ☜ حەسحەس

**عەسکەر / esker'/**: ناو. چەکداری دەوڵەت ☰ سپاهی

**عەسکەری / eskerî'/**: ناو. جۆرێ ترێ سپیلکە ☰ انگور عسکری

**عەسڵ**[١] / 'es(i)ł/: ناو. ئەسڵ؛ خود؛ خودی خۆ ‹عەسلی بەڵگە› ⚏ اصل

**عەسڵ**[٢]: ئاوەڵناو. ڕەسەن؛ ماک ‹جنسی عەسل› ⚏ اصل

**عەسڵزادە** / 'esłzade/: ئاوەڵناو. تانوپۆ ئاوریشم؛ نەجیمزادە ⚏ نجیبزادە

**عەسڵەن** / 'eslen/: ئاوەڵکار. عەسڵەنی؛ بە هیچ جۆرێ؛ بە هیچ کلۆجێ ⚏ اصلاً

**عەسڵەنی** / 'eslenî/: ☜ عەسڵەن

**عەسڵی** / 'esłî/: ئاوەڵناو. کۆکی؛ بنەڕەتی ⚏ اصلی

**عەسەس** / 'eses/: ناو. چەرخەچی؛ پاسەوانی شەو ⚏ عسس

**عەسەلا** / 'esela/: ناو. ئەسبابات و کەلوپەلی ناو ڕەشماڵ ⚏ اسباب و لوازم سیاەچادر

**عەشامات** / 'eşamat/: ☜ حەشامات

**عەشایەر** / 'eşayer/: ناو. تیرە و هۆز ⚏ عشایر

**عەشایری** / 'eşay(i)rî/: ئاوەڵناو. ڕەوەندی؛ خێڵەکی؛ عێلاتی؛ پێوەندیدار یان سەر بە عەشایر ⚏ عشایری

**عەشرەت** / 'eşret/: ناو. عاشیرەت ‹عەشرەت زۆرە، وەختی کولێرە «مەسەل»› ⚏ عشیرت

**عەشق** / 'eş(i)q/: ☜ عیشق

**عەشقبازی** / 'eşqbazî/: ناو. ١. ئەوینداری؛ ئاکاری ئەویندار بۆ نواندنی ئەوینەکەی ٢. [مەجاز] هاوجێیی؛ نزیکی؛ پێوەندی جنسی ⚏ ١و٢. عشقبازی

**عەشیر** / 'eşîr/: ☜ عەشیرەت

**عەشیرە** / 'eşîre/: ☜ عەشیرەت

**عەشیرەت** / 'eşîret/: ناو. عەشیر؛ عەشیرە؛ تایەفە؛ تیرە؛ خزم؛ هۆز ⚏ عشیره

**عەعا** / 'e'a/: ☜ عەعە

**عەعە** / 'e'e/: ناو. [منداڵانە] عەعا؛ عاعا؛ پیسایی بە زمانی منالان ⚏ عن

**عەف** / 'ef/: دەنگەناو. حەپەی سەگ ⚏ پارس سگ

**عەفازە** / 'efaze/: ناو. ١. بن خەرمان ٢. میوەی وشکەوبوو بە دارەوە ⚏ ١. تە خرمن ٢. میوەی خُشکیدە بر درخت

**عەفت** / 'eft/: دەنگەناو. وەڕە؛ حەپەی سەگ ⚏ پارس سگ

**عەفتاوە** / 'eftawe/: ناو. ئەفتاوە؛ ئافتاوە؛ بریک؛ دەفری خۆ شۆردن لە کناراو ⚏ آفتابە

**عەفتە** / 'efte/: ناو. زڕت؛ جرت ⚏ شیشکی

**عەفرە** / 'efre/: ناو. زۆرانی؛ زۆران؛ زۆرەبانێ ⚏ کُشتی

**عەفعەف** / 'ef 'ef/: دەنگ. حەپ-حەپ؛ دەنگی وەڕینی سەگ ⚏ عو ـ عو سگ

**عەفو** / 'afû/: ناو. عافوو؛ چاوپۆشی؛ نوخاف؛ لێبووردوویی؛ جەب؛ جەبە؛ کار و ڕەوتی لێخۆش بوون ‹خوا عەفووی کا!› ⚏ عفو؛ بخشایش

**عەفوکراو** / 'efûk(i)raw/: ئاوەڵناو. نوخافتی؛ بەخشراو ⚏ مغفور؛ بخشودە

**عەفونەت** / 'efûnet/: ☜ عفونەت

**عەڤدال** / 'evdal/: ☜ عەودال

**عەڤر** / 'ev(i)r/: ناو. عەور؛ هەور ⚏ ابر

**عەڤراز** / 'evraz/: ناو. هەوراز؛ بەرزایی ڕێگە ⚏ سربالایی

**عەڤرەمیش** / 'evremîş/: ناو. ئاوریشم؛ هەورێشم ⚏ ابریشم

**عەقڵ** / 'eq(i)ł/: ناو. ئاوەز؛ ئەقل؛ هەقل؛ ئەقل؛ مژی؛ مەژگ؛ مخت: ١. هزر؛ بیر؛ هش؛ ویر؛ ژیری؛ فام؛ هێزی تێگەیین، بۆچوون یان تێفکرین، بەتایبەت بە شێوەی گونجاو ٢. توانستی بەهرە گرتنی ڕاست و باش لە هێزی زەینی ⚏ ١و٢. عقل

⊡ **عەقڵ بڕ کردن:** ☜ **عەقڵ پێ شکان**

**عەقڵ بڕین:** *[مەجاز]* ڕێ تێ چوون؛ جێ بڕوا بوون ☰ با عقل جور درآمدن

**عەقڵ پێ شکان/ شکیان:** عەقڵ بڕ کردن؛ لێ تێگەیشتن؛ سەر لێ دەرکردن ☰ فهمیدن

**عەقڵ تێکچوون:** عەقڵ گۆڕان؛ خەرفان؛ لێویان ☰ عقل زایل شدن

**عەقڵ گەیین:** تێگەیشتن؛ فامین ☰ درک کردن

**عەقڵ لە چاوا بوون:** *[کینایە]* هەر ڕواڵەت دیتن ☰ ظاهربین بودن

**عەقڵ لە چۆکدا بوون:** *[کینایە]* بێعەقڵ بوون؛ بێمێشک بوون ☰ عقل نرسیدن

**عەقڵ هەڵگرتن:** عاقڵانە بوون؛ لەتەک عەقڵا خوێندن؛ لەگەڵ عەقڵدا (ڕاست) هاتنەوە؛ بە عەقڵ جۆر دەرهاتن ☰ با عقل جور درآمدن

**عەقڵی خۆ دانە دەستی کەسێکەوە:** *[مەجاز]* خۆ بە کەسێکی‌تر سپاردن و بیر نەکردنەوە ☰ عقل خود را به دست کسی دادن

**عەقڵی کەسێک سێ سوچ بوون:** *[مەجاز]* کەسێک کەم‌عەقڵ بوون ☰ عقل کسی پاره سنگ برداشتن

**لەتەک عەقڵدا خوێندن:** ☜ **عەقڵ هەڵگرتن**

**لەگەڵ عەقڵدا (ڕاست) هاتنەوە:** ☜ **عەقڵ هەڵگرتن**

**عەقڵانی** / 'eqłanî/: ناوەڵناو. ١. بەر پەسەندی عەقڵ؛ گونجاو لەگەڵ عەقڵدا ‹ڕێگەچارەی عەقڵانی› ٢. سەر بە عەقڵ؛ پێوەندیدار بە ئاوەز و عەقڵەوە ‹خوێندنەوەی زانستی و عەقڵانی بۆ پرسە جیاوازەکان› ☰ ١و٢. عقلانی

**عەقڵدار** / 'eq(i)łdar/: ناوەڵناو. ژیر؛ عاقڵ؛ بەئاوەز ☰ عاقل

**عەقڵسووک** / 'eq(i)łsûk/: ناوەڵناو. گەوج؛ نەفام ☰ ابله

**عەقڵلەچاو** / 'eq(i)łleçaw/: ناوەڵناو. *[مەجاز]* تایبەتمەندی کەسێ کە تەنیا ڕواڵەت دەبینێ و لێ ورد نابێتەوە ☰ ظاهربین

**عەقیدە** / 'eqîde/: ناو. باوەڕ؛ بڕوا ☰ عقیده

**عەک** / 'ek/: دەنگ. دەک؛ حەک ‹عەک ماڵت نەشێوێ بۆ کارێ کردت!› ☰ واه

**عەکاس** / 'ekas/: ناو. وێنەگر؛ ڕەسم‌کێش ☰ عکاس

**عەکاسی** / 'ekasî/: ناو. ١. کار و پیشەی عەکاس ٢. دووکانی وێنە گرتن ☰ ١و٢. عکاسی

**عەکس** / 'ek(i)s/: ناو. وێنە؛ ڕەسم ☰ عکس

**عەگ** / 'eg/: ناوەڵناو. سپی‌بۆر (بزن) ☰ سفید مایل به خاکستری (بُز)

**عەگال** / 'egal/: ☜ **عەگاڵ**

**عەگاڵ** / 'egał/: ناو. عەگال؛ ئەگاڵ؛ پەتی بە ئالقەی سەری عەرەبان ☰ عقال

**عەگن** / 'egin/: ☜ **عەگید**

**عەگول** / 'egul/: ☜ **عەگوڵ**

**عەگوڵ** / 'eguł/: ناو. عاگول؛ عەگول؛ وشترخۆرە؛ حوشترخوار؛ وشترالووک ☰ خارشتر

**عەگیت** / 'egît/: ☜ **عەگید**

**عەگید** / 'egîd/: ناوەڵناو. عەگن؛ عەگیت؛ ئەگیت؛ ئازا؛ پاڵەوان؛ جامێر؛ جوامێر ☰ شُجاع

**عەلاج** / 'elac/: ناو. عیلاج: ١. دەرمان؛ چارەسەری ‹عەلاجی نەخۆشی› ٢. چار؛ هاول؛ هاویل ‹عەلاجی ئەو کارە، پارەیە› ☰ ١و٢. علاج

⊡ **عەلاج کردن:** ١. دەرمان کردن؛ چا کردنەوە ٢. چارە بۆ دۆزینەوە ☰ ١. معالجه کردن ٢. راه حل یافتن

**عەلاج نەبوون:** ١. بێدەرمان داکەوتن ٢. بێدەرمان بوون ٣. هیچ ڕێچارێ بەدی نەکردن ‹عەلاج نییە دەبێ چاوەڕوان بین› ☰ ١. درمان نشدن ٢. درمان نداشتن ٣. ناچار بودن

**عەلاج هاتن:** ١. دەرمان بوون؛ چا بوونەوە ٢. ڕێگا بۆ چارەسەری هەبوون ☰ ١. مُعالجه شدن ٢. راه حل داشتن

**عەلاحەدە** / 'elaĥede/: ئاوەڵناو. عەلاحیدە؛ جیاواز؛ جیاکار ‹ژووری عەلاحەدە› ☰ جداگانه

**عەلاحیدە** / 'elaĥîde/: ☜ **عەلاحەدە**

**عەلاف**[1] / 'elaf/: ناو. عەللاف؛ ئالیکفرۆش؛ کەسێک چیلکە و خەڵووز و کا و وێنجە دەفرۆشێ ☰ علاف

**عەلاف**[2]: ئاوەڵناو. سەرگەردان؛ عەللاف؛ ئەلاف؛ وێڵ؛ بەتاڵپا؛ تووشیاری چاوەڕوانی و هاتوچۆی بێکەڵک ☰ علاف

**عەلاقە** / 'elaqe/: ناو. ١. مەیل؛ بارودۆخی دڵ پێوە بوون ٢. بەین؛ پەیوەند؛ هاموشۆ؛ ناسین ‹وام لێ مەعلووم بوو کە لە بەغداشەوە عەلاقەی دەگەڵ مەرکەزی فەرماندەیی بارزانی هەر نەپساندۆتەوە ... «هەژار؛ چێشتی مجێور»› ٣. زەنگیانە؛ مووررووی زۆر ورد ☰ ١. علاقه ٢. ارتباط ٣. منجوق

**عەلاقەبەند** / 'elaqebend/: ناو. ١. قەزاز؛ زەنگیانەهۆن؛ هۆنەری وردە مووررووو و زەنگیانە ٢. زەنگیانەفرۆش؛ فرۆشیاری خشڵ و زرق و بەرقی جلوبەرگ ☰ ١. منجوقکار ٢. منجوق‌فروش

**عەلاقەبەندی** / 'elaqebendî/: ناو. کاری عەلاقەبەند ‹وشتر و عەلاقەبەندی؟! «مەسەل»› ☰ منجوق‌کاری

**عەلامەت**[1] / 'elamet/: ناو. نیشانە؛ نیشان؛ دروشم ☰ علامت

**عەلامەت**[2]: ئاوەڵناو. سەیر؛ سەمەرە؛ عاجباتی ☰ عجیب

**عەلبەکی** / 'elbekî/: ناو. دەفری مسی بنەدار ☰ ظرف مسین پاشنه‌دار

**عەلتووش** / 'eltûş/: ناو. کاری هیچ و پووچ ☰ کار بیهوده

**عەللاف** / 'ellaf/: ☜ **عەلاف**

**عەلماندن** / 'elmandin/: چاوگ. ڕاهێنان؛ فێر کردن ☰ یاد دادن

**عەلمتی** / 'elm(i)tî/: ئاوەڵناو. ڕاهاتوو؛ فێربووگ؛ ڕاهێندراو ☰ تعلیم‌دیده؛ آموزش‌دیده

**عەلۆ جەلۆ** / 'elo celo/: ئاوەڵناو. عەلوو ـ جەلوو؛ ڕەجالە؛ ڕووتەوپووتە؛ خۆڕیوتۆڕی ☰ اوباش؛ رجاله

**عەلۆعەلۆ** / 'elo 'elo/: ☜ **عەلەشیش**

**عەلوو ـ جەلوو** / 'elû celû/: ☜ **عەلۆ ـ جەلۆ**

**عەلووعەلۆ** / 'elû 'elo/: ☜ **عەلەشیش**

**عەلووک** / 'elûk/: ناو. حولیک؛ هەڵووژە؛ حولووک ☰ آلو

**عەلووکە** / 'elûke/: ناو. هەڵووژە؛ هەڵووچە؛ ئالووچە ☰ آلوچه

**عەلووکەڕەشە** / 'elûkeřeşe/: ناو. هەڵووچکە ☰ آلوبُخارا

**عەلەشیش** / 'eleşîş/: ناو. عەلۆعەلۆ؛ عەلووعەلۆ؛ عەلیشیش؛ ئەلیشیش؛ بۆقلە؛ قەلەموونە؛ بەقلەمووت ☰ بوقلمون

**عەلەم** / 'elem/: ناو. ١. ئالا؛ بەیداخ؛ بەیاخ ٢. کەمایەسی؛ کەموکورتی ‹ساغ ساغە، هیچ عەلەمی تێدا نییە› ☰ ١. پرچم ٢. کاستی؛ نقص

**عەلەولەمانی** / 'elewlemanî/: ناو. جۆرێ هەنجیر ☰ نوعی انجیر

**عەلەوی** / 'elewî/: ئاوەڵناو. ١. سەر بە حەزرەتی عەلی ٢. لە وەچ و بەرەی حەزرەتی عەلی ☰ ١و٢. علوی

**عەلەیک** / 'eleyk/: ☜ **عەلەیکمەسەلام**

**عەلەیکمەسڵام** / 'eleyk(i)mes(i)łam/: ☜ **عەلەیکمەسەلام**

**عەلەیکمەسەلام** / eleyk(i)meselam/': سارستە. عەلەیک؛ عەلەیکمەسلام؛ عەلەیکەسەلام؛ سلاو لە ئێوە (لە وەلامی سلاودا) علیکم‌السلام

**عەلەیکەسەلام** / eleykeselam/': ☜ عەلەیکمەسەلام

**عەلیبوردە** / elîburde/': ناو. نان لە تۆزاشی ئاشەوان نان از آردمُزد آسیابان

**عەلیخانێ** / elîxanî/': ناو. جۆرێ قوماشی حەریر نوعی پارچه حریر

**عەلیشیش** / elîşîş/': ☜ عەلەشیش

**عەلیق** / elîq/': ناو. ئالیک؛ ئالک؛ ئیم؛ یێم؛ کا و جۆ؛ پێخۆری ئاژەڵان علیق

**عەلیل** / elîl/': ئاوەڵناو. ١. سەقەت؛ سەکەت؛ گەزنگاز ٢. داماو؛ داماگ؛ داکەوتوو ١. علیل ٢. درمانده

**عەڵاجەوی** / ełacewî/': ☜ بەڵاجەوی

**عەڵبە** / ełbe/': ☜ عەربە

**عەمار** / emar/': ☜ هەمار

**عەماراو** / emaraw/': ☜ هەماراو

**عەمارتە** / emarte/': ناو. ماڵێ کە نهۆمێکی لە ژێر زەمیندایە خانه‌ای که زیرزمین دارد

**عەمارەپۆ** / emarepo/': ☜ عەمبارەپۆ

**عەمارەت** / emaret/': ناو. باڵەخانە؛ ئابیدە؛ خانووبەرەی زل و بڵند عمارت

**عەمامە** / emame/': ناو. عامامە؛ مێزەرە؛ سەروپێچی مەلا عمّامه

**عەمانج** / emanc/': ☜ ئامانج

**عەمبار** / embar/': ناو. کۆمگە؛ هەمار انبار

**عەمباراو** / embaraw/': ☜ هەماراو

**عەمبارەپۆ** / embarepo/': ناو. عەمارەپۆ؛ عەنبارەپۆ؛ هەمارەپۆ؛ کالای رزیوی نێو عەمبار جنس پوسیده در انبار

**عەمباڵ** / embał/': ☜ حەماڵ-١

**عەمبە** / embe/': ناو. ئەنبە: ١. دارێکی بەرز و جوانی هەمیشە شینە کە لە ناوچە گەرمەکاندا دەڕوێ ٢. میوەی ئەو دارە ١. درخت انبه ٢. میوەی انبه

**عەمبەر** / ember/': ناو. عەنبەر؛ ماکێکی بۆنخۆشی ڕەشە کە لە ورگی جۆرە ماسییەکدا بەرهەم دێ عنبر

**عەمبەربۆ** / emberbo/': ناو. عەنبەربۆ؛ جۆرێ برینجی بۆنخۆشە وەک سەدری نوعی برنج مُعطر

**عەمبەڵی** / embełî/': ئاوەڵناو. تایبەتمەندی کەسێ کە لە هەموو شۆڕاوێک دوودڵ و بە بێزە وسواس در نظافت

**عەمر** / em(i)r/': ناو. ١. تەمەن؛ عومر؛ ماوەی ژیان ‹من عەرسەی مەیدان عەمرم کەردەن تەی/ ساقی مەی دانت سا کەی مەبۆ، کەی؟ «سەیدی»› ٢. فەرمان؛ دەستوور ١. عُمر؛ سن ٢. امر

□ **عەمر درێژ بوون:** تەمەن درێژ بوون؛ زۆر ژیان (وەک نزایەک دەگوترێ) ‹ئەی یاخوا عەمرت درێژ بێ رۆڵە!› عُمرِ طولانی کردن

**عەمر کردن:** ١. عومر کردن؛ ژیان ٢. دەسوور دان ١. امر کردن ٢. عُمر کردن

**عەمر نەمان:** تەمەن کورت بوون؛ نەژیان (وەک تووک و نفرینێ دەگوترێ) ‹ئەی عەمرت نەمێنێ بۆ کارێ کردت!› مُردن

**عەمری خوا کردن:** مردن؛ لە دنیا دەرچوون مُردن

**عەمردرێژ** / em(i)rd(i)rêj/': ئاوەڵناو. عومردرێژ؛ عەمەدرێژ؛ خاوەن ژیانێکی دوور و درێژ. هەروەها: **عەمردرێژی** مُعمَّر

□ **عەمردرێژ بوون:** عەمەدرێژ بوون؛ زۆر ژیان؛ ساڵانێکی زۆر بە سەر دنیاوە بوون (**تێبینی:** وەکوو دوعایەک بۆ سپاس لە خزمەتی کەسێ،

یان بە پێچەوانە بۆ دەربڕینی نارەزایەتی لە کاری خۆشەویستیێ دەگوترێ) 🇮🇷 عمر طولانی کردن

**عەمرۆکە** / emroke'/: ناو. عەمرووکە؛ گیایەکە وەک گوڵەگەزیزە، دوو بست بەرز دەبێ، ڕەنگی شین و سپی و بنەوشە، لە مانگی بانەمەڕدا گوڵ دەردەکا، شیرەی لاسقەکانی زۆر لینجە و وەک تاڵ کێشی دێ 🇮🇷 گیاهی است

**عەمرووکە** / emrûke'/: ☜ **عەمرۆکە**

**عەمرە** / emre'/: ☜ **عومرە**

**عەمە** / eme'/: ناو. ١. عەمبە؛ ئەنبە ٢. *[سووکەڵە]* عومر؛ تەمەن ‹عەمـەدرێژ بی! ئەمـە چ کـارێ بـوو کردت؟› 🇮🇷 ١. انبه ٢. عُمر

**عەمەدرێژ** / emed(i)rêj'/: ☜ **عەمردرێژ**

**عەمەل** / emel'/: ناو. عەمەڵ: ١. ئاکـار؛ ڕەوشـت ٢. برینکاری؛ نەشـتەرگەری. هـەروەها: **عەمـەل کردن** 🇮🇷 ١. اخلاق ٢. عمل جراحی

**عەمەلە** / emele'/: نـاو. عەمەڵـە؛ فەعلـە؛ فەلـە؛ کارگەر؛ کرێکار 🇮🇷 کارگر

**عەمەڵ** / emeł'/: ☜ **عەمەل**

**عەمەڵە** / emełe'/: ☜ **عەمەلە**

**عەن** / en'/: نـاو. عە؛ عـەعا؛ پیسـی؛ پیسـایی بـە زاراوەی منداڵان 🇮🇷 عن

**عەنبار** / enbar'/: نـاو. ١. ☜ **هـەمـار** ٢. ☜ **حەماڵ**

**عەنباراو** / enbaraw'/: ☜ **هەماراو**

**عەنبارەپۆ** / enbarepo'/: ☜ **عەمبارەپۆ**

**عەنباڵ** / enbał'/: ☜ **حەماڵ**

**عەنبەر** / enber'/: ☜ **عەمبەر**

**عەنبەراوی** / enberawî'/: ناوەڵـناو. عەنبـەرین؛ تێکەڵ بە عەمبەر 🇮🇷 عنبرین

**عەنبەربۆ** / enberbo'/: ☜ **عەمبەربۆ**

**عەنبەرین** / enberîn'/: ☜ **عەنبەراوی**

**عەنت** / ent'/: ناو. بوغز؛ ناخۆشەویستی 🇮🇷 کینە

**عەنتەر** / enter'/: ناو. ئەنتەر؛ حەمتـەر؛ حەنتـەر؛ فلفـل؛ قونسـوور؛ مـەیموونی لـۆتی؛ چەشـنێ مـەیموون بـە قـوونی ڕووت و سـوور و کلکـی درێژەوە 🇮🇷 انتر

**عەنتەرمـەزاج** / entermezac'/: ناوەڵـناو. *[پـلار]* وازوازی؛ تاوتـاوی؛ شـێتەوژیرە؛ حولحـولی؛ عەنتەرتەبیعەت؛ هەردەم لە سـەر خەیاڵـێک 🇮🇷 دمدمی

**عەنتیک** / entîk'/: ناوەڵناو. ئـەنتیک: ١. کـەونارا؛ کەڤنارا؛ سەر بە سەردەمانی کـۆن ٢. نـەخت و هێژا ‹خۆشە سەرخۆشـی ئەگـەر تووشـی ڕەفیقـی تووش نـەبی/ ڕابـوێری هـەر بـە گـۆرانی و قسـەی عەنتیکەوە «بێکەس»› 🇮🇷 ١. آنتیک ٢. ارزنده

**عەنتیکە**[1] / entîke'/: نـاو. ١. شتی زۆر بەقیمـەت ٢. مـرۆی قسـەخۆش ٣. قسـەی خـۆش 🇮🇷 ١. بسـیار بـا ارزش ٢. آدم خـوش‌صـحبت ٣. سـخن طنزآمیز

**عەنتیکە**[2]: ناوەڵـناو. ١. ئـەنتیک؛ نایـاب ‹وەکـوو ماسی بە سەربەستی، غەواسی گێـژ و بـن ئـاوم/ لـە بنکی بەحری فیکـرا گەوهـەری عەنتیکـە دەردێـنم «قانع»› ٢. *[پلار]* سەیر و سەمەرە ‹ئا ئـەم کراسـە عەنتیکـە چییـە کردووتـە بـەرت؟!› 🇮🇷 ١. عتیقـە؛ آنتیک ٢. عجیب

**عەنتیکەخانە** / entîkexane'/: ☜ **ئەنتیکەخانە**

**عەنتیکـــــــــەفرۆش** / entîkef(i)roş'/: ☜ **ئەنتیکەفرۆش**

**عەنتین** / entîn'/: چاوگ. دژایەتی کردن؛ خـۆش نەویستن؛ ڕک لێبوون ‹تـە مـن دعەنتینـێ› 🇮🇷 عناد ورزیدن

**عەنجور** / encur'/: ☜ **ئەنجوڕ**

**عەنجوڕ** / encûř'/: نـاو. خرچـە؛ ئـەنجوور؛ قـەرە خرچە 🇮🇷 خربُزەی کال

**عەندەلی** / endelî'/: نـاو. جورەیـەکی کاکۆڵـدارە

⚑ پرندەی کوچک کاکُل به سر

**عەنرین / 'enrîn/**: ☜ **عنرین**

**عەنزەرووت / 'enzerût/**: ناو. ئەنزەرووت؛ گوژە؛ کووژەرە؛ شیلەی تالی بڕێ لە دارچک و دەوەنی بیاوانی بە ڕەنگی سوور یان زەرد کە زۆربەیان بۆ دەرمان ئەشێن ⚑ انزروت

**عەنقا / 'enqa/**: ناو. سیمر؛ سیمورغ؛ سیرنگ؛ مەلێکی ئەفسانەیی، نمانای ژیری کە گوایە لە کێفی قافدا دەژی ⚑ سیمُرغ؛ عنقا

**عەنناب / 'ennab/**: ناو. بەرێکی سوورە لە سنجوو دەکا ⚑ عناب

**عەنوا / 'enwa/**: ☜ **ئەنوا**

**عەنی / 'enî/**: ناو. ئەنی؛ هەنیە؛ توێڵ ⚑ پیشانی

**عەو / 'ew/**: دەنگەناو. ١. عا؛ عە؛ وشەی دەنگدانی مێگەل ٢. عەف؛ حەپە ⚑ ١. کلمەی نهیب به گله ٢. عَو؛ پارس سگ

**عەوار / 'ewar/**: ☜ **عەووار**

**عەوام[1] / 'ewam/**: ناو. خەڵکی ڕەشۆکی و نەخوێندەوار ‹عەوام لە عەوام قەت نابێ حالی/ کاسە پڕ نابێ لە گۆزەی خالی «فولکلور»› ⚑ عوام

**عەوام[2]**: ئاوەڵناو. ڕەمەکی؛ ڕەشۆکی؛ نەخوێندەوار ‹خەڵکی عەوام› ⚑ عامی

**عەوامانە / 'ewamane/**: ئاوەڵناو. ١. پێوەندیدار یان سەر بە خەڵکی نەخوێندەوار و ڕەشۆکی ٢. ڕەمەکی؛ بە شێوەی نازانستی یان نەنووسراو ‹شیعری عەوامانە› ⚑ ١و٢. عامیانە

**عەوان / 'ewan/**: ئاوەڵناو. شووفار؛ شەیتانیکەر ⚑ سخن‌چین

**عەوت / 'ewt/**: دەنگەناو. حەپە؛ عەف ⚑ عَو؛ پارس سگ

**عەوتەعەوت / 'ewte'ewt/**: دەنگ. حەپەحەپ؛ عەف ـ عەف ⚑ عَو ـ عَو سگ

**عەوداڵ / 'ewdał/**: ئاوەڵناو. عەبدال؛ عەبدال؛ عەڤدال؛ عەودل؛ ئەودال؛ گەڕیدەی بێماڵ ‹لە ژێر زنجیر و کۆتا دەنالی/ مەگەر دیوانەی، شێتی، عەودالی؟ «هێمن»› ⚑ خانەبدوش

**عەودڵ / 'ewdił/**: ☜ **عەبداڵ**

**عەوڕ / 'ewr/**: ☜ **عەڤر**

**عەورەت / 'ewret/**: ناو. ١. شەرمی ژن و پیاو ٢. [کنایه] عافرەت؛ ئافرەت ⚑ ١. عورت ٢. زن؛ جنس دوم

**عەوق / 'ewq/**: ئاوەڵناو. ١. قەتیس؛ بێدەرەتان؛ دەگیر کەوتوو ٢. وەدرەنگ‌کەوتوو ⚑ ١. گیرافتادە ٢. به تأخیر افتادە

⊡ **عەوق مان**: یەک کەوتن؛ دۆخی لە گەڕ کەوتن ‹هاتۆتە سەر ئەمە لە سەرتدا سەر هەڵبڕە/ مەحوی! ئەم ئیشی خێرە لەسەر تۆیە ماوە عەوق «مەحوی»› ⚑ وقفه روی دادن

**عەولاد / 'ewlad/**: ناو. منداڵ؛ ڕۆڵە ⚑ اولاد

**عەولە / 'ewle/**: ئاوەڵناو. خاترجەم؛ ئارخەیان ⚑ خاطرجمع

**عەووار / 'ewwar/**: ئاوەڵناو. عەوار؛ گیرۆدە ‹لە بەر باڵم عەووارم› ⚑ گرفتار

**عەوە / 'ewe/**: ناو. دەرەقەت؛ عۆدە ‹هێندە بەهێزە کەس لە عەوەی نایە› ⚑ عُهده

**عەوەعەو / 'ewe'ew/**: دەنگ. حەپەحەپ؛ وەڕەی سەگ ⚑ عَو ـ عَو سگ

**عەهد / 'ehd/**: ناو. پەیمان؛ سۆز؛ بەڵێن؛ وەعد ⚑ عهد

**عەیار[1] / 'eyar/**: ناو. ١. ڕێژەی کانزایەکی گرانبایی لە کانە یان ئالیاژێکدا ‹زێڕی هەژدە عەیار› ٢. پێستەی مەڕ و بزن ⚑ ١. عیار ٢. پوست برکندەی بُز و گوسفند

⊡ **تەواوعەیار بوون**: بێ‌خەوش بوون؛ هیچ دەخێڵەی تێدا نەبوون ‹بەقاڵ بەزازێکی ئەرمەنی بە ناوی سەعید، کوردێکی تەواوعەیار بوو

«هەژار، چێشتی مجێور»» ﷼ خالص بودن

**عەیار**[٢]: ئاوەڵناو. ١. فێڵباز؛ گزیکار؛ داوباز ‹وەرامی داوە مەعشووقەی عەیار/ وتی: خۆشەویست بۆ مـن برینـدار! ... «قـانع»› ٢. چەلـەنگ؛ نـازفرۆش؛ بەتـەور و تـووز ‹تەسـک و تـەنک و تـەیارە/ کـچ بێـوەژن عـەیارە! «فولکلـۆر»› ﷼ ١. نیرنگبـاز ٢. عشوەگر

**عـەیـارپێوی / 'eyarpêwî/**: نـاو. ١. کـــاری دەسنیشان کردنی ڕێژەی کانزایـەکی گرانبـایی لە شتێکدا ٢. *[کیمیا]* کـاری دەرخسـتنی ڕادەی ماکی تێکئالاو لە تراوێکدا ﷼ ١و٢. عیارسنجی

**عـەیـارە / 'eyare/**: نـاو. حـەیارە: ١. پێوانـە ٢. بەردی تەرازوو ﷼ ١. پیمانه ٢. سنگ ترازو

**عەیام / 'eyam/**: ناو. ڕۆژگار؛ دەمـان؛ زەمانـە ﷼ ایّام

**عەیب / 'eyb/**: ناو. عەیو: ١. شـوورە؛ شـوورەیی؛ ئەوەی کـە لەگـەڵ داب و بایـەخی کۆمەڵـگادا یەک ناگرێتـەوە ٢. زەدە؛ نوقسـتانی ٣. *[کینایە]* عەورەت ‹عەیبی بزن هەمیشە دیـارە› ﷼ ١. عـار ٢. نقص ٣. اندام تناسلی

⊡ **عەیب بون**: ١. ناباو بوون ٢. کێشە هەبوون ﷼ ١. عیب بودن ٢. ایراد داشتن

**عەیب پێوە نان**: عەیب لێ نان؛ عەیب بۆ (کەس یان شتێک) دۆزینەوە ﷼ عیب انداختن (به کس یا چیزی)

**عەیب تێدا بون**: نـەقس لـە شـتێکدا بـوون ﷼ عیب داشتن

**عەیب گرتن**: خراپی شـتێک گێڕانـەوە ﷼ ایـراد گرفتن

**عەیب لێ پەیدا بون**: خەشدار بـوون؛ عەیبـدار بوون ﷼ ایراد داشتن

**عەیب لێنان** ☜ **عەیب پێوە نان**

**عەیبی شتێک بون**: شـتێک بـە عـەیب زانـین ‹ئەی وەتەن! کەی خۆش ئەبێتۆ زامی پـڕئێش و بەسۆت؟/ عەیبی بێخێویت نەبێ، هەر زێڕ و زیوە تانوپۆت «قانع»› ﷼ ننگ دانستن

**پێ عەیب بون**: بە عەیب زانین؛ لە لا عار بوون ‹تا ئەم دواییانە، لە کوردستان و بەتایبەت شـاری سنەدا، دوو پیشە پاوانی جوو بوو؛ یەکەم بژیشکی و دووهەم زێڕینگەری. تەنانەت وایان لێ کردبـوو، زۆرێک لـە موسوڵـمانان پێیـان عـەیب بـوو زێـڕ بفرۆشن یان بژیشکی بخـوێنن! «*مەشاهیر*»› ﷼ عیب آمدن

**عەیبار / 'eybar/**: ☜ **عەیبدار**

**عەیبدار / 'eybdar/**: ئاوەڵناو. عـەیبار؛ زەدەدار ﷼ معیوب

**عەیبدۆز / 'eybdoz/**: ئاوەڵـناو. ١. تایبەتمەنـدی کەسێ یا دەزگایێ کە عەیب و نەقسی کەسێ یا شـــتێ دەدۆزێتـــەوە ٢. لێگـــر؛ ئیرادگـــر؛ تایبەتمەندی کەسێ کە هەمیشـە لـە عـەیب و کەمایەسی دەگەڕێ ﷼ ١. عیبیاب ٢. ایرادگیر

**عـەیبگر / 'eybgir/**: ئاوەڵـناو. لێگـر؛ ئیرادگـر؛ خووگرتوو بە عەیب گرتن ﷼ عیبجو

**عـەیبوعـار / 'eyb û 'ar/**: نـاو. شـوورەیی و نـەگونجاوی ‹ئـازیز پرسـیاری عـەیبوعـار نییـە/ ئەمسال مەیلەکەت وێنەی پار نییـە «فولکلـۆر»› ﷼ عیبوعار

**عەیبە / 'eybe/**: ناو. عەیبوعار؛ کاری شـوورەیی ‹ئەم ژنەتیوە عەیبە نازانێ› ﷼ عار

**عەیبەت / 'eybet/**: ☜ **حەیبەت**

**عەیبەتان / 'eybetan/**: ☜ **حەیبەت**

**عەید / 'eyd/**: ناو. عید؛ جەژن ﷼ عید

⊡ **عەیدا مەزن**: عیدا مـەزن؛ عیـد قـوروو؛ عەیـد قوروان؛ جێژنی قوربان ﷼ عید قربان

**عەیش / 'eyş/**: ناو. خۆشگوزەرانی؛ ڕەوتی خـۆش ڕابواردن ﷼ عیش

**عـەی . عـەی** / ey  'ey'/: دەنـگ. ١. وشـــەی سەیرمان ٢. دەنگی لێخوڕینی مێگـەل ☰ ١. وه؛ کلمەی تعجب ٢. کلمەی راندن گله

**عەیلەمەن** / eylemen'/: ☜ **عاینەمەل**

**عـەیـن**[١] / eyn'/: نـاو. نـاوی عـــەرەبی پـــیتی حەڤدەهەمینی ئەلفوبێی زمانی کوردی ☰ حرف عَین

**عەین**[٢]: ☜ **عەینەن**

**عـەیـن**[٣]: ئـامراز. وەکـــوو؛ هـــەر وەک ‹عـــەین تـــۆ ئەنووسێ› ☰ عینِ

**عەینک** / eynik'/: ناو. ئاوێنه؛ ئایەنه؛ جام ☰ آیینه

**عەینومەغان** / eyn û meğan'/: ☜ **عەینەن**

**عەینومەین** / eyn û meyn'/: ☜ **عەینەن**

**عەینەت** / eynet'/: ☜ **عەینەن**

**عەینەک** / eynek'/: ناو. چاویلکه ☰ عینک

**عەینـــەکی** / eynekî'/: ئاوەڵـــناو. چاویلکـــــەیی؛ چاڤکی؛ بەرچاڤکی؛ چاویلکه له چاو ☰ عینکی

**عەینەمەل** / eynemel'/: ناو. ١. ☜ **عاینەمەل** ٢. کانیاوێ که ئاوی له مـەزرا دەپـرژێنن، خـەزایی پێوه دیـت ☰ ١. ☜ **عاینەمەل** ٢. چشـمەای کـه آبش را برای جلب سار ملخ‌خوار، بر کشتزار می‌پاشند

**عەینەن** / eynen'/: ئاوەڵکار. عەین؛ عەینومەغان؛ عەینومەین؛ عەینەت؛ تەواو وەک ☰ عیناً

**عەیو** / eyw'/: ☜ **عەیب**

**عیار** / (i)yar'/: ناو. چەرم؛ پێست؛ کەوڵ ☰ چرم

**عیبـادەت** / îbadet'/: ناو. کار و ڕەوتی پەرسـتن و بەندایەتی نیشان دان ☰ عبادت

**عیبرانـی** / îbranî'/: نـاو. ١. هـــۆزی ســـامی لـــه فەلەســتینی کۆنــدا کــه بــه زمــانی عیــبری دەئاخاوتن و جوولەکەی ئێستا خۆیان لەو هـۆزه دەزانن ٢. هەر یەکه له کەسـانی ئـەو هـۆزه ☰ ١و٢. عبرانی

**عیبری** / îbrî'/: ناو. ١. لـه زمانگـەلی سـامی کـه خەڵکی کەونارای فەلستین قسەیان پێ دەکـرد ٢. زمانی ئایینی جوو ☰ ١و٢. عبری

**عید** / îd'/: ☜ **عەید**

◽ **عید ڕوژه:** جەژنی ڕەمەزان ☰ عید فطر

**عید قوروان:** ☜ **عەیدا مەزن**

**عید قورو:** ☜ **عەیدا مەزن**

**عید گەپە:** جەژنی نەورۆز ☰ عید نوروز

**عیدا مەزن:** ☜ **عەیدا مەزن**

**عیددە** / îdde'/: ناو. *[شەرع]* ئاڤێر؛ حەیبه؛ ماوەیـێ کـه ژن پـاش تـەڵاق یـان شـوو مـردن، مـافی مێردکردنەوەی نییه ☰ عِدّه

**عیرفـان** / îrfan'/: ناو. بـڕوا بـه دۆزینـەوەی ڕاز و نهـێنی دنیــا، بــه بــیر کردنــەوه و ڕامــان و تێهەڵچوونی ڕۆح (نه لـه ڕێـی تـاقی کردنـەوه و بەڵگەی زانستییەوه) ☰ عرفان

**عیرفـانی** / îrfanî'/: ئاوەڵـناو. عاریفانـه؛ سـەر بـه عیرفان ‹هۆنراوەی عیرفانی› ☰ عرفانی

**عیرفایی** / îrfayî'/: ناو. جۆرێک کورتـانی قـوڵ و نەرم بۆ سواری ☰ نوعی پالان نرم و کوتـاه بـرای سواری

**عیزرایـل** / îzrayil'/: نـاو. پێمێـرد؛ فریشـــتەی گیان‌کێشان ☰ عزرائیل

**عیسـایی** / îsayî'/: ئاوەڵـناو. ١. سـەر بـه عیسـای پێغەمبەر ٢. کریستیان؛ مەسیحی ☰ ١. عیسوی ٢. مسیحی

**عیسک** / îsk'/: ناو. نزگەره؛ ئیسکه ☰ سکسکه

**عیشا** / îşa'/: نـاو. ١. نوێژی خـەوتنان ٢. *[کینایه]* هیچ ‹هێنده فەقیره عیشایه خودای شـک نابـا› ☰ ١. نماز عشاء ٢. هیچ

**عیشت** / îşt'/: نـاو. زڵلـەی لــه پشــت مــل ☰ پس‌گردنی

**عیشق** / îşq'/: ناو. عەشق؛ ئەشق؛ ئیشق؛ ئەشـک؛ ئەڤین؛ ئەوین؛ دڵداری ☰ عشق

**عیشقاو** / îşqaw/: ناو. [شووروەیی] تەڕایی سەر نێرینەی پیاو لە کاتی تاودانی جینسیدا ◘ وَدی

**عیشوە** / îşwe/: ناو. کەشم؛ ناز؛ ناز و نیمناز ◘ عشوه

**عیشوەفرۆش** / îşwef(i)roş/: ئاوەڵناو. نازکەر؛ عیشوەگەر ‹گوتی: ئەی نازەنینی عیشوەفرۆش!/ کەم‌کەمە دیارە بێوەفایی تۆش «هێمن»› ◘ عشوه‌گر؛ طناز

**عیفریت** / îfrît/: ناو. [باوەڕی کۆن] دێو؛ جنۆکەی زەبەلاح ◘ عفریت

**عیلاج** / îlac/: ☜ عەلاج

**عیلاقە** / îlaqe/: ناو. پەیوەندی ◘ ارتباط

▣ **عیلاقە کردن**: [کینایە، شووروەیی] سەرجێیی کردن؛ جووت بوونی نێر و مێ ◘ عمل جنسی انجام دادن

**عیلک** / îlk/: ناو. تەڕپیرەژن یا پیاوی دڵتەڕ ◘ پیرمرد یا پیرزنی که مانند جوانان رفتار کند

**عیلم** / îl(i)m/: ناو. زانست؛ زانیاری ◘ علم

▣ **عیلمی غەیب**: پێوارناسی؛ زانستی ڕازە نهێنییەکان ◘ علم غیب

**عیلمە** / îlme/: ناو. هێلمە؛ ئیلمە؛ گرێ مافوورە ◘ گره قالی

**عیمالە** / îmale/: ناو. ئیمالە؛ دەستوور؛ حوقنە؛ ئامرازی تێڕۆ کردنی تراوی زگشۆر بۆ ناو زگ ◘ اماله

▣ **عیمالە کردن**: خاوێن کردنەوەی ڕیخۆڵە بە تێڕۆ کردنی زگشۆر بە ناو زگدا ◘ اماله کردن

**عینوان** / înwan/: ناو. ١. ناز و فیز لە بەر جوانی ‹سیاسییەکانمان هێند بە عینوانن/ خەڵک بە مەخلووقی خۆیان ئەزانن «پیرەمێرد»› ٢. ناو و ناوبانگ ‹ئەی وەتەن ڕۆم و عەجەم موشتاقی کوردستانتە/ ئیفتیخاری میللەتی کورد شەوکەتی عینوانتە «حەمدی ساحیبقەران»› ◘ ١. تکبر و ناز ٢. آوازه

**عیو** / îw/: دەنگ. ١. دەنگێ کە لە کاتی شادی و داوەتدا دەگوترێ ‹زاوای بەر دەرگای ئاواتی دڵ، عیو/ بووکی ڕازاوەی جوانتر لە گوڵ، عیو «گۆران»› ٢. دەنگێ بۆ ڕاو نان ◘ ١. بانگ شادی ٢. صدایی برای راندن

**عیونای** / îwnay/: چاوگ. قریواندن ◘ چاوگ

**عێ** / ê/: ناو. ناوی پیتی حەڤدەهەمینی ئەلفوبێی زمانی کوردی ◘ عَین؛ هفدهمین حرف الفبای زبان کُردی

**عێجز** / êciz/: ☜ عاجز

**عێدز** / êdiz/: ☜ عاجز

**عێزەت** / êzet/: ناو. حورمەت؛ ڕێز ◘ عـزّت؛ احترام

**عێل** / êl/: ناو. عێڵ؛ خێڵ؛ ڕەوەند؛ کۆچەر ◘ ایل

**عێلات** / êlat/: ناو. ئەو تیرە ڕەوەندانەی دەچنە زۆزان ◘ ایلات

**عێلاتی** / êlatî/: ئاوەڵناو. سەر بە عێلات ◘ ایلاتی

**عێلجاری** / êlcarê/: ناو. زبارە؛ گەل؛ هەرەوەز؛ کاری بە کۆمەڵ ◘ ایلجار

**عێلی** / êlî/: ئاوەڵناو. بڵند ◘ بلند

**عێڵ** / êł/: ☜ عێل

**عێنگرین** / êng(i)rîn/: ☜ عنرین

**عێو** / êw/: دەنگەناو. وشەی دەنگ دانی ڕان ◘ صوت راندن گله

▣ **عێو کردن**: هۆی کردن؛ دەنگ دانی ڕان ‹خەیاڵم وا بوو گۆچانی نەسیحەت هەڵگرم بۆ ڕان/ وەکوو موسا لە دەشتی ئەقدەسا، شوانانە هەر عێو کەم «قانع»› ◘ هی کردن به گله

**عێوارەش** / êwareş/: ناو. گەردەلوول؛ گێژەڵووکە؛ تۆز و بای توند ◘ گردباد

# غ

**غ / ğ/**: پیت. نیشانەی پیتی هەژدەهەمی ئەلفوبێی زمانی کوردی ☰ غ؛ نشانەی حرف هجدهم الفبای کُردی

**غ / ği/**: ناو. ناوی پیتی هەژدەهەمی ئەلفوبێی زمانی کوردی ☰ غ؛ حرف هجدهم الفبای کُردی

**غائیز / ğa'îz/**: ناو. غایس: ١. چۆنیەتی فل بوون و بوورانەوە لە گەرمان ٢. چۆنیەتی ڕەق بوون و تەزین لە سەرمان * هەروەها: **غائیز کەوتن** ☰ ١. بی‌حالی از گرما ٢. کرخی از سرما

**غاپۆرە / ğapore/**: ناوەڵناو. سەرقاڵ؛ زۆر خەریک بە کارەوە ☰ سرگرم کار

**غار / ğar/**: ناو. ١. ئەشکەوت؛ شکەفت؛ هلۆلی و ڕەهۆلی سروشتی لە کێودا ‹جە هیچ مەنزڵێ نەگیرمێ قەرار/ تا بشمێ وە بان پای دامان غار «سەیدی»› ٢. دڕک؛ دڕوو؛ چقڵ ٣. بەز؛ چوارە؛ کاری بە هەڵەداوان و پرتاو ڕۆیشتن ٤. زەمینی ڕەق و پتەو ٥. چۆنیەتی سوور و سەخت بوونەوەی سواڵەت و ... لە ئاگردا ٦. هەڵمات؛ کەللا ☰ ١. غار ٢. خار ٣. دو؛ تاخت ۴. زمین سخت ۵. حالت سُرخ و سخت شدن سُفال و ... بر آتش ۶ تیله

⊡ **غار پێ دان**: ☜ **غار پێ کردن**

**غار پێ کردن**: غار دان؛ غار پێ دان؛ تاو دان؛ لنگار دان ☰ دواندن؛ چهارنعل تازاندن

**غار دان**: غار کردن؛ غار کرن؛ ڕاکردن؛ بەزین؛ هەڵاتن؛ خار دان ☰ دویدن؛ تاختن

**غار کردن**: ☜ **غار دان**

**غار کرن**: ١. بە سەر دوژمندا دان ٢. ☜ **غار دان** ☰ ١. بر دشمن تاختن ٢. ☜ **غار دان**

**غارا**[1] / ğara/: ناو. خارا؛ پارچەیەکی بەناوبانگە ‹جلکی هەموو غارا و دارایە› ☰ نوعی پارچە

**غارا**[2]: ناوەڵناو. ١. لە کار دەرهاتوو ٢. لە کلدا سوورەوەبوو ☰ ١. کارکُشتە ٢. در کورە پُختە

**غاران / ğaran/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //غارای؛ دەغاریێ؛ بغاریێ// غارین؛ خاران: ١. سوور و سەخت بوونەوە (سواڵەت و ...) لە ئاگردا ٢. دەباخی بوونی پێست ٣. *[مەجاز]* ئەزموون دەسکەوتن و فێر بوونی کار ☰ ١. سُرخ و سخت شدن (سُفال و ...) در آتش ٢. دبّاغی شدن پوست ٣. تجربە دیدن و کار یاد گرفتن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: غاراو/ چاوگی نەرێنی: نەغاران

**غاراندن / ğarandin/**: ☜ **خاراندن**

**غاراو / ğaraw/**: ناوەڵناو. غاریو؛ خاراو: ١. لە کوورە دەرهاتوو (سواڵەت) ٢. دەباخدراو (پێست) ٣. *[مەجاز]* فێرەکار کراو (لەش) ☰ ١. از کورە

درآمده (سُفال و ...) ٢. دباغی شده (پوست) ٣. آزموده و کاری

**غارپێدەر** / ğarpêder/: ناو. ڕەتێنەر؛ ئەوەی دەبێتە هۆی غار دانی گیاندار یان شتێک ☰ دواننده

**غارغارۆکێن** / ğarğarokên/: ☜ **غارغارێن**

**غارغارێن** / ğarğarên/: ناو. غارغارۆکێن: ١. گریوە ڕا؛ گریوە غار؛ خارخارێن ٢. تارتارێن؛ تەڕاتێن؛ ڕەم و ڕەمبازی ☰ ١. مسابقەی دو ٢. تاخت‌وتاز

**غارگە** / ğarge/: ناو. شوێنی غاردان ☰ میدان تاختن

**غارناسی** / ğarnasî/: ناو. زانستی ناسینی ئەشکەوت و چۆنیەتی و تەمەنی بەدی‌هاتنیان ☰ غارشناسی

**غارنشین** / ğarn(i)şîn/: ئاوەڵناو. نیشتەجێی غار ☰ غارنشین

**غارنشینی** / ğarn(i)şînî/: ناو. ئەشکەوت‌نشینی: ١. لە نێو ئەشکەوتدا ژیان ٢. قۆناغێک لە ژیانی سەرەتایی مرۆ کە خەڵک لە ئەشکەوتدا دەژیان ☰ ١و٢. غارنشینی

**غارەک** / ğarek/: ناو. کاری لەناکاو بە سەردا دان ☰ یورش ناگهانی

**غارین** / ğarîn/: ☜ **غاران**

**غاریو** / ğarîw/: ☜ **غاراو**

**غاز** / ğaz/: ناو. ١. سکەی دەغەل ٢. گاز ٣. ☜ **قاز** ☰ ١. سکەی تقلبی ٢. گاز ٣. ☜ **قاز**

**غازوق** / ğazuq/: ☜ **خازوق**

**غازە** / ğaze/: ناو. سوهراف؛ سۆراف؛ سووراو؛ سووراڤک؛ سووراوی خۆ جوان کردن ☰ غازە

**غازی** / ğazî/: ناو. جۆرێ سکەی لە زێڕ و زیوی ترکانی عوسمانی ☰ نوعی سکەی طلا و نُقرەی عُثمانی

**غافڵ** / ğafił/: ☜ **خافڵ**

**غافڵان** / ğaf(i)łan/: ☜ **خافڵان**

**غافڵاندن** / ğaf(i)łandin/: ☜ **خافڵاندن**

**غافڵگیر** / ğafiłgîr/: ئاوەڵناو. بێ‌ئاگاداری؛ ناکامگیر؛ تووشی بارودۆخی پێش‌بینی نەکراو ☰ غافلگیر

⊡ **غافڵگیر بوون**: ئامادە نەبوون بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ڕووداوێکدا ‹کە بابی دیت غافڵگیر بوو، نەیتوانی جگەرەکەی بشارێتەوە›.

هەروەها: **غافڵگیر کردن** ☰ غافلگیر شدن

**غاڵب** / ğałib/: ئاوەڵناو. سەرکەوتوو؛ چێر؛ زاڵ ☰ غالب

**غاڵبە** / ğałbe/: ئاوەڵناو. پڕایی؛ زۆرینەی؛ زۆربەی ‹غاڵبەی خەڵک دەستەنگن و ناتوانن بە باشی بە سەلامەتییان ڕابگەن› ☰ اکثریت

**غاڵیگە** / ğałîge/: ☜ **خاڵیگە**

**غایان** / ğayan/: چاوگ. خایان؛ پێچوونی ماوە؛ ڕابردنی دەم و کات ☰ وقت/ زمان بردن

**غایاندن** / ğayandin/: ☜ **خایاندن**

**غایب** / ğayib/: ئاوەڵناو. نەهاتوو ‹ئازاد دوێنێ غایب بوو› ☰ غایب

**غایس** / ğayis/: ☜ **غائیز**

**غایلە** / ğayle/: ناو. ختوورە؛ دڵەڕاوکێ و نیگەرانی ☰ تشویش و نگرانی

⊡ **غایلە کردن**: تووشی دڵەڕاوکێ بوون ‹دڵت غایلە نەکا! زۆر جێی متمانەیە› ☰ دچار تشویش و نگرانی شدن

**غاین** / ğayin/: ☜ **خاین**

**غڕ** / ğiř/: ☜ **خڕ**[٢]-١

**غز**[١] / ğiz/: ناو. سەرڕێژی هەویری هەڵهاتوو و ماستی ترشاو ☰ سرریز خمیر تخمیر شده و ماست تُرشیده

**غز**[٢]: ☜ **خز**[٢]

**غزسه** / ğizse/: ناو. ڕەوتی ترشانی هەویر یان ماست ☰ فرایند تُرشیدن خمیر یا ماست

**غلفۆش** / ğilfoş/: ناو. سلپە؛ تلتەی نیشتوو ☰ دُرد؛ تُفاله

**غللۆر**[١] / ğillor/: ناو. ئۆتوز؛ غلۆر؛ خلۆر؛ خللۆر؛ گلار؛ تل ☰ غلت

⊡ **غللۆر بوونەوە:** خلۆر بوونەوە؛ تل بوونەوە؛ تلەو بوون. هەروەها: **غللۆر کردنەوە** ☰ غلتیدن از بالا به پایین

**غللور**[٢]: ئاوەڵناو. غلور: ١. لە بەر قەڵەوی بزۆز و دانەسەکناو (گا) ٢. /کینایە، پلار/ غور؛ خۆبایی؛ بادیهەوا (بە هۆی دەسەلات، دەوڵەمەندی یان جوانی) ‹... پەت شل کردنی قاسم، شیووەی بەربەرەلا کرد. وەها غللوور و یەرغە بوون بە هەزاران لغاو ڕام نەدەکران ... «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ ١. فربه و سرکش (گاو) ٢. سرکش و مغرور (از قدرت، ثروت یا زیبایی)

**غلور** / ğ(i)lur/: ☜ **غللور**

**غلۆر** / ğ(i)lor/: ☜ **غللۆر**

**غلەغل** / ğ(i)leğil/: ☜ **خلەخل**

**غلّت** / ğiłt/: ناو. ڕاوە؛ وراوە؛ ورینە؛ وڕێنە؛ خوتە؛ گلتە؛ غلّتە؛ هوڕێنە ☰ هذیان

**غلّتاندن** / ğiłtandin/: چاوگ. ڕاواندن؛ وەڕینە کردن ☰ هذیان گفتن

**غلّتە** / ğiłte/: ☜ **غلّت**

**غلّتەغلّت** / ğiłteğiłt/: ناو. غلّتەی لە سەر یەک ☰ هذیان مداوم

**غنزیل** / ğinzîl/: ئاوەڵناو. ١. سەرسەخت؛ پێچەقێن ٢. زاڵم؛ ناحەقیکار ☰ ١. سرسخت ٢. ظالم

**غوباب** / ğubab/: ناو. ١. بوغە؛ گای غللوور ٢. بەرخەبەبە؛ بەرچێڵە؛ غەبغەبە ☰ ١. گاو فربه و سرکش ٢. غبغب

**غوربەت** / ğurbet/: ناو. غوروەت: ١. دوورەوڵات؛ دووروەڵات؛ دوورولات؛ جێگەی دوور لە زێد و نیشتمان ٢. غەریبی؛ نەناسیاوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی نامۆ بوون ☰ ١. غُربت ٢. غریبی

**غورچ** / ğurç/: ناو. بەرانی شاخدار ☰ قوچ

**غورفی** / ğurfî/: ☜ **خەرفاو**

**غوروەت** / ğurwet/: ☜ **غوربەت**

**غوراب** / ğuřab/: ناو. غوڕراب؛ گەرمە؛ قووڵایی (خەو) ‹... حاکم لە غورابی خەو ڕادەپەڕێ و شێتانە بە پێژامەوە ڕا دەکا بزانێ لەم جەنگەی گەرمایەدا چ قەوماوە؟ «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ خواب عمیق

**غورابی** / ğuřabî/: ناو. قوڕابی؛ جۆرێ شیرنی بە ئارد و شەکر ☰ نوعی شیرینی

**غوڕراب** / ğuřřab/: ☜ **غوراب**

**غورە** / ğuře/: مناو. ١. گورە؛ خرۆش ٢. کێبەرکێی خوێندنی کەو ‹لێی گەڕە دەندووکی بە بەرد تیژ بکا/ غورە بکا و بانگی کوڕ و کیژ بکا «ئاوات»› ☰ ١. خروش ٢. مسابقەی کبک‌خوانی

**غورەکەو** / ğuřekew/: ناو. کاری کەو لە بەر یەک ڕاگرتن کە بۆ یەکتر بخوێنن ☰ عمل کبک را در مقابل هم گذاشتن تا در برابر هم بخوانند

**غوژ** / ğuj/: ئاوەڵناو. داماو؛ دژ؛ کز؛ کزوولکەکردوو ☰ کزکرده

**غوسڵ** / ğus(i)ł/: ناو. /شەرع/ عوسڵ؛ وسڵ؛ بسمیل؛ کاری خۆ شتن بە ئاو، بە ڕێوڕەسمێکی تایبەتی بۆ پاک بوونەوە و نزیکی لە خودا ‹غوسڵ لە هەر ئایینێکدا ڕێوڕەسمی تایبەت بە خۆی هەیە› ☰ غُسل

⊡ **غوسڵی تەعمید:** /ئایین/ کاری شۆردنی لەش بە ئاو پێدا کردن یا پرشانی ئاوی پیرۆز بە ڕێوڕەسمێکی تایبەت بۆ وەرگرتنی دین، بەتایبەت دینی مەسیح ☰ غسل تعمید

⊡ **غوسڵ دان:** *[شەرع]* ١. شۆردنی لەشی مردوو، پێش کفن و دەفن، بەپێی فەرمانی شەرع ٢. ☜ **غوسڵ کردن** ▤ ١. غُسل دادن ٢. ☜ **غوسڵ کردن**

**غوسڵ کردن:** *[شەرع]* غوسڵ دان؛ لەشپیسی دەرکردن ▤ غُسل کردن

**غولام** / ğulam/: ناو. غولام؛ خولام: ١. خزمەتکار؛ نۆکەر ٢. بەنی؛ کۆیلە ▤ ١. نوکر ٢. بنده

**غولامەتی** / ğulametî/: ناو. نۆکەری؛ خولامەتی ▤ غُلامی

**غولۆلیف** / ğulolîf/: ناو. ئەشکەوت ▤ غار

**غولە** / ğule/: ناو. چین؛ چینی پرچ و... ▤ چین و شکن

**غوڵام** / ğułam/: ☜ **غولام**

**غوڵامانە** / ğułamane/: ☜ **خوڵامانە**

**غوڵغوڵە** / ğułğułe/: ناو. هەرا- هەرا؛ زەنا- زەنا ▤ غُلغُله

**غوڵە** / ğułe/: ناو. دەنگی دووری لێڵ و نامەعلووم ▤ صدای از دور و نامفهوم

**غوڵەغوڵ** / ğułeğuł/: ناو. دەنگەدەنگی لە دوورەوە و لێڵ کە لێ تێنەگەی ▤ سر و صدای از دور و نامفهوم

**غومار**[١] / ğumar/: ناو. تۆز؛ تۆز وخۆڵ؛ خاک و خۆڵ؛ تەپوتۆز ▤ گرد و غبار

**غومار**[٢]: ناوەڵناو. خومار؛ مەست (چاو) ▤ خُمار

**غونچە** / ğunçe/: ☜ **خونچە**

**غونچەدەم** / ğunçedem/: ناوەڵناو. دەمخونچە؛ دەمتەنگ؛ نوقڵەدەم؛ بە دەمێکی وەک خونچە بچووک و جوانەوە ‹بە دەستی غونچەدەمێ دەستی دا کە بەیعەت بۆم/ چ ئارەزوومە لە «عیسا» دەم و لە «مووسا» دەست؟! «مەحوی»› ▤ غُنچەدهان

**غۆری** / ğorî/: ناو. قۆری؛ چادان ▤ قوری

**غۆڕ** / ğoř/: ☜ **قۆڕ**

**غۆڕی** / ğořî/: ☜ **قۆڕی-١**

**غووشە** / ğûşe/: ناو. ١. هێشوو؛ وشی؛ هووشی ٢. گوڵەدەخڵ ▤ ١. خوشەی میوە ٢. خوشەی غله

**غوول** / ğûl/: ناو. *[فەرهەنگی خەڵکی]* دێو؛ ئەرژەنگ؛ درنج؛ هەوولا؛ خووڵ؛ بوونەوەرێکی خەیاڵی ▤ غول

**غەبغەب** / ğebğeb/: ☜ **غەبغەبە**

**غەبغەبە** / ğebğebe/: ناو. غەبغەب؛ بەرچێڵە؛ بەرخەبەبە ▤ غبغب

**غەدار** / ğedar/: ناوەڵناو. ١. پەیمانشکێن؛ بێبەڵێن؛ بێبەینەت ٢. زاڵم؛ ناحەقیکار ▤ ١. پیمان‌شکن ٢. ظالم

**غەدارە** / ğedare/: ناو. جۆرێ شمشێری کورت و دەمپان ▤ قدّاره

**غەدداری** / ğeddarî/: ناو. کامباخی؛ پەیمان شکێنی ▤ عهدشکنی

**غەدر** / ğed(i)r/: ناو. ١. پەیمانشکێنی؛ بێبەڵێنی ٢. ناهەقی و زوڵم ٣. خەیانەت. هەروەها: **غەدر کردن؛ غەدر لێ کران؛ غەدر لێ کردن** ▤ ١. عهدشکنی ٢. غدر ٣. خیانت

**غەربەنگ** / ğerbeng/: ناو. گیایەکە تۆمێکی وردی وەک تۆم خاشخاش دەگرێ ▤ گیاه هره

**غەربیل** / ğerbîl/: ناو. بێژنگ ▤ غربال

**غەردەل** / ğerdel/: ☜ **خەرتەلە**

**غەرغەرە** / ğerğere/: ناو. غەڕغەڕە: ١. کاری ئاو یان تراوی دەرمان لە دەم و گەروو وەردان و شۆردنی قوڕگ و بنزار ‹ غەرغەرەی ئاوخوێ بۆ پەتا زۆر باشە› ٢. تراوی تایبەت بۆ شۆردنی دەم و گەروو ‹غەڕغەڕەشی بۆم نووسیوە› ٣. غەڕەغەڕە؛ قرقرە؛ مەکارە ▤ ١و٢. غَرغَره ٣. قِرقِره

⊡ **غەرغەرە کردن:** ئاو لە دەم و گەروو دان

‹شەوان پێش خەو ئاوخوێ غەرغەرە بکە!› 🕮 غَرغَرە کردن

**غەرق** / ğerq/: ئاوەڵناو. نوقم؛ نوقمەسار؛ نخرۆ 🕮 غرق

⊡ **غەرق بون**: نوقم بوون 🕮 غرق شدن

**غەرقە** / ğerqe/: ناو. دۆشەکی منداڵان کە نایلۆنی تێ دەخەن 🕮 تشک با برگ نایلونی برای کودکان

**غەرە** / ğere/: ناو. هێلم؛ جۆرێ چرێشی دارتاشان 🕮 چسب نجّاری

**غەرەز** / ğerez/: ناو. ١. کینە؛ قین؛ ڕک ٢. مەبەست؛ نیاز 🕮 ١. کینە ٢. قصد؛ منظور

⊡ **غەرەز لە دڵدا بون**: ڕک و قین لە دڵدا بوون 🕮 کینە بە دل داشتن

**غەرەزن**[1] / ğerezin/: ناو. غەرەزەنگ؛ خەرەزەنگ؛ خەرزڕ؛ زنجیری دەستی چاروادار 🕮 زنجیر چاردوال

**غەرەزن**[2]: ناو. ڕکوونی؛ قینەون؛ قینلەدڵ؛ ڕکلەزک. هەروەها: **غەرەزنی** 🕮 کینەتوز

**غەرەزەنگ** / ğerezeng/: ☜ **غەرەزن**[1]

**غەریب** / ğerîb/: ئاوەڵناو. غەریو: ١. دوور لە زێد و نیشتمان ‹نە خوێش نە دڵسۆز نە دۆس جاران/ غەریب و بێکەس، دوورکەفتەی شاران «شێخ نەسیم مەردۆخی»› ٢. بەستەزمان و گێلۆکە ٣. خەمین؛ خەمبار ‹سبەینێ هەستە مەوەستە خەبەر بگەینە ولات/ دیارە چەندە حەزین و غەریب و بێکەیفین «حاجی قادر»› ٤. سەیر؛ سەمەرە ‹بە دەوری قوتبی دەم، خەتتی عیزارت دایرەی کێشا/ ئوفوق بۆتە موعەددل، پێم غەریبە هەیئەتی جوانت «شەفیعی بۆکانی»› 🕮 ١. غریب ٢. سادەدل ٣. حزین ٤. عجیب

**غەریبسنجان** / ğerîbsincan/: ناو. تەختەپیتی؛ جووجە 🕮 ساس

**غەریبکوژ** / ğerîbkuj/: ☜ **بێکەس کوژ**

**غەریبگەز** / ğerîbgez/: ناو. چەشنێ گەنە کە چز پێوەدانی لە کەسانی نامۆدا دەبێتە هۆی یاو و نەخۆشی 🕮 غریب‌گز

**غەریبۆک** / ğerîbok/: ناو. جۆرێ هەرمێ 🕮 نوعی گلابی

**غەریبە** / ğerîbe/: ئاوەڵناو. نەناس: ١. نامۆ؛ غەریب؛ بێگانە؛ غەوارە؛ هاقی؛ ڕەمەن ‹هەموو نامۆن و من تاک و غەریبەم/ نەماوە ئاشنا بۆ کوێ نەزەر کەم؟ «جەلال مەلەکشا»› ٢. بیانی؛ بیانە؛ نەژناس؛ نائاشنا؛ نەناسراو؛ نەناسیاو ‹دەرگا لە مرۆی غەریبە مەکەوە!› 🕮 ١و٢. غریبە

**غەریبەیی** / ğerîbeyî/: ناو. نامۆیی؛ بێگانەیی 🕮 بیگانگی

**غەریبی** / ğerîbî/: ناو. دوورولاتی؛ دوورەولاتی؛ نەناسیاوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی نامۆ بوون 🕮 غریبی

⊡ **غەریبی کردن**: نامۆیی کردن: ١. بە هۆی کەس‌نەناسینەوە، بێ‌تاقەت و دڵتەنگ بوون ‹غەریبی مەکە وەرە لامان دانیشە با دوو قسە بکەین› ٢. بە هۆی نەناسینی شوێن و جێگای دەور و بەرەوە، مات و کز بوون و دوور گرتن 🕮 ١و٢. غریبی کردن

**کەوتنە غەریبی**: کەفتنە غوربەت؛ لە دیاری نامۆ گیرسانەوە 🕮 بە دیار غُربت افتادن

**غەریزە** / ğerîze/: ناو. خۆماک؛ خدوو: ١. توانایی، لێهاتووی و باری سروشتی یان میراتی لە هەر شتێکدا ٢. هۆکاری سروشتی یان ژێنیتیکی بۆ کردەوە و کاردانەوەگەلی ناویستەکی و خۆبەخۆیی 🕮 ١و٢. غریزە

**غەریو** / ğerîw/: ☜ **غەریب**

**غەرێز** / ğerêz/: ناو. گیای بژار؛ گیای خۆڕسک کە زیانی بۆ گیای پێویست هەیە 🕮 گیاه هرز

**غەڕاندن** / ğeřandin/: چاوگ. بە هەڵە بردن؛ فریو دان 🇮🇷 فریب دادن

**غەڕغەڕە** / ğeřğeře/: ناو. ١. ئاویلکە؛ گیانەلاو؛ دەمی سەرەمەرگ ٢. ☜ غەرغەرە 🇮🇷 ١. حالت نزع ٢. ☜ غەرغەرە

**غەڕە** / ğeře/: ئاوەلناو. بادیهەوا؛ غللوور؛ لەخۆبایی ‹لە خەی غەڕە بووە و هەر کارێک بیهەوێ دەیکا› 🇮🇷 مغرور

**غەڕەغەڕە** / ğeřeğeře/: ☜ غەرغەرە ـ٣

**غەڕین** / ğeřîn/: چاوگ. هەڵخەڵەتان؛ فریو خواردن 🇮🇷 فریب خوردن

**غەز** / ğez/: ناو. خەز؛ دەڵەک؛ جانەوەرێکە، کەوڵی بەنرخە 🇮🇷 خز

**غەزا** / ğeza/: ناو. ١. چێشت؛ خواردەمەنی ٢. /ئیسلام/ شەڕی ئایینی؛ شەڕ بۆ ڕەزای خوا 🇮🇷 ١. غذا ٢. جهاد؛ غزا

**غەزاخۆری** / ğezaxorî/: ناو. چێشتخانە؛ خواردنگە 🇮🇷 غذاخوری

**غەزال** / ğezal/: ☜ غەزاڵ

**غەزاڵ** / ğezał/: ناو. غەزال؛ کەژاڵ؛ خەزاڵ؛ خەزال؛ کەژەڵ؛ مەراڵ؛ ماراڵ؛ ئاسک؛ ئاس؛ مامز؛ کارمامز؛ مامبز؛ بانبز؛ ئاهوو؛ ئاهی؛ مەبرە؛ جەیران؛ گیانداریکی گوانداری گیاخۆری جووت سمە، بە قەد بزنێک دەبێ، دەست و پێی بلند و باریک و لەشی کەمتووکە 🇮🇷 غزال

**غەزایی** / ğezayî/: ناو. خەزایی؛ عایلەمەن؛ عەینەمەل 🇮🇷 سار ملخ‌خوار

**غەزر** / ğezr/: ناو. ١. گە؛ گەی؛ مان ٢. تووڕەیی زۆر 🇮🇷 ١. اعتصاب ٢. غضب

**غەزرین** / ğezrîn/: چاوگ. ١. لە جێ لانەکەوتن؛ مان گرتن؛ گەگرتن ٢. زۆر تووڕە بوون 🇮🇷 ١. اعتصاب کردن ٢. غضبناک شدن

**غەزریو** / ğezrîw/: ئاوەلناو. ١. گەی کردوو؛ مانگرتوو ٢. زۆر تووڕە ‹وەک بەرازی غەزریوە› 🇮🇷 ١. اعتصاب کرده ٢. غضبناک

**غەزگاڵ** / ğezgał/: دۆعا. خۆزیا؛ خۆزگا؛ بریا 🇮🇷 کاشکی

**غەزگوو** / ğezgû/: ناو. بەرۆشی زلی مسی 🇮🇷 دیگ بزرگ مسین

**غەزنە** / ğezne/: ناو. ١. خەزنە؛ خەزێنەی دراو ٢. چلکی ناو کوان 🇮🇷 ١. خزانه ٢. چرک دُمل

**غەزوبەز** / ğez û bez/: ناو. چەوری و پیو 🇮🇷 چربی و پیه

**غەزوە** / ğezwe/: ناو. /ئیسلام/ هەر یەکە لە شەڕەکانی پێغەمبەری ئیسلام لەگەڵ دوژمنانیدا 🇮🇷 غزوه

**غەزەب**[1] / ğezeb/: ناو. غەزەو؛ تووڕەیی؛ ڕک؛ جنگزی؛ قەلسی 🇮🇷 غضب

⊡ **خوا غەزەب لێ گرتن:** تووشی بەلا و نەهامەت بوون 🇮🇷 به بلا و مصیبت گرفتار شدن

**غەزەب**[2]: ئاوەلناو. غەزەو؛ دەمارگرژ؛ جنگز؛ ڕکین ‹کابرایەکی زۆر غەزەبە، خۆتی لێ بپارێزە› 🇮🇷 خشمگین

**غەزەتە** / ğezete/: ناو. ڕۆژنامە 🇮🇷 روزنامه

**غەزەتەچی** / ğezeteçî/: ناو. ڕۆژنامەنووس 🇮🇷 روزنامه‌نگار

**غەزەل** / ğezel/: ☜ غەزەڵ

**غەزەڵهۆن** / ğezełhon/: ☜ غەزەڵبێژ

**غەزەڵ** / ğezeł/: ناو. غەزەل: ١. خەزەڵ؛ گەلای زەردی پایز ٢. جۆرێ پارچەی ئاورێشمین ٣. شیعری عاشقانە ٤. هەڵبەستێک پتر بە ٧ تا ١٣ بەیتەوە، هەموو لە سەر یەک کێش و یەک سەروا 🇮🇷 ١. برگ خزان ٢. نوعی پارچەی ابریشمی ٣. شعر عاشقانه ٤. غزل

**غەزەڵبێژ** / ğezełbêj/: ناو. غەزەلهۆن؛ غەزەڵبێژ؛ دانەری غەزەڵ 🇮🇷 غزلسرا

**غەزەڵوەر / ğezełwer/:** ☜ **خەزەوڵوەر**

**غەزەڵهۆن / ğezełhon/:** ☜ **غەزەڵبێژ**

**غەزەو[1] / ğezew/:** ناو. ١. ☜ **غەزەب** ٢. پیسی؛ چەپەڵی؛ غەزەوات ☰ ١. ☜ **غەزەب** ٢. کثافت

**غەزەو[2]:** ☜ **غەزەب[2]**

**غەزەوات / ğezewat/:** ☜ **غەزەو[1] ـ٢**

**غەزێم / ğezêm/:** ☜ **خەزێم**

**غەزێنە / ğezêne/:** ☜ **خەزنە**

⊡ **غەزێنە کردن:** ڕاگــرتنی بژێــو بــۆ دواڕۆژ ☰ نگهداشتن آذوقه

**غەژگا / ğejga/:** ناو. گای زلی ناوچەی تەبـەت و بەرزاییەکانی ئەو وڵاتە، بە ڕەنگی قاوەیی مەیلەو ڕەش، کەوییــەکانی جەســتەیان چکۆڵــەترە و باریشیان پێ دەکێشن ☰ غژگاو

**غــەش / ğeş/:** نــاو. ١. زەدە؛ کەمایەســـــی ٢. خەوش؛ ناڕەسەنی ☰ ١. زده؛ عیب ٢. ناخالصی

**غەشیم / ğeşîm/:** ☜ **خەشیم**

**غەل / ğel/:** ناو. هێلەک؛ ئێلەک ☰ الک

**غەلابازەڵە / ğelabazełe/:** ☜ **غەلەبازەڵە**

**غەلاخ / ğelax/:** ناو. غەلاغ؛ قەلەبەلەکە ☰ کـلاغ ابلق

**غەلاغ / ğelağ/:** ☜ **غەلاخ**

**غەلاندن / ğelandin/:** چـاوگ. خەلاندن؛ هێنانـە هێلنج ☰ به تهوع آوردن

**غەلفە / ğelfe/:** ☜ **خەڵفە**

**غەلوخەدەنوک / ğeluxedenûk/:** ناو. لـووتپـان؛ جۆرێک مراوی ☰ مُرغابی نوک‌پهن

**غەلە / ğele/:** ☜ **خەلە**

**غەلەبازڵە / ğelebaz(i)łe/:** ☜ **غەلەبازەڵە**

**غەلــەبازەڵــە / ğelebazełe/:** نــاو. غەلابازەڵــە؛ غەلەبازڵە؛ قشقەڕە؛ قشقرە؛ قشقەڵە ☰ زاغی

**غەلیفی / ğelîfî/:** ناو. جۆرێک درووманی ناوەوەی جلک ☰ تودوزی

**غەلین / ğelîn/:** چاوگ. خەلین؛ کەلین؛ هێلــنج هاتنەوە ☰ تهوع داشتن

**غەڵ / ğeł/:** ناو. ئاغەڵ ☰ آغُل

**غەڵبە / ğełbe/:** ناو. دەنگی تێکەڵاوی حەشامات ☰ هیاهوی جمعیت

**غەڵبەغەڵب / ğełbeğełb/:** ناو. هەرا و قرموقـاڵ؛ غەڵبەی زۆر ☰ جنجال و هیاهو

**غەڵبیر / ğełbîr/:** ناو. غەڵوێر؛ غەربیل؛ بێژنگ ☰ غربال

**غــەڵتانن / ğełtanin/:** چـاوگ. تلانــدن؛ تلانــن؛ تلاندنەوە ☰ غلتاندن

**غەڵتیان / ğelt(i)yan/:** چاوگ. تلان؛ تلانـەوە ☰ غلتیدن

**غەڵدە / ğełde/:** ناو. ١. غوڵە؛ دەنگی لە دوورەوە کە کەسێ تێ ناگا ٢. غلــتە؛ وڕاوە ☰ ١. صـدای دور نامفهوم ٢. هذیان

**غەڵدەغەڵد / ğełdeğeld/:** ناو. غوڵەغوڵ؛ غوڵەی زۆر ☰ سر و صدای دور و نامفهوم

**غــەڵدی / ğełdî/:** نـاو. تولــەقەندی؛ تولــەقەنی؛ تولەی ڕاو؛ سەگی بچکۆڵـە، بـۆ چوونـە کـون و هەڵفڕاندنی مەل ☰ سگ کوچک‌اندام شکاری

**غەڵف / ğełf/:** ☜ **خەڵف**

**غەڵوێر / ğełwîr/:** ☜ **غەڵبیر**

**غــەڵــەبایی / ğełebayî/:** نــاو. غەڵـــــەبە: ١. ســەرکەوتوویی؛ چــیری؛ زاڵــی ٢. حەشـامات؛ خەڵکی زۆر لە شـوێنێک ☰ ١. چیرگـی ٢. انبـوه مردم

**غەڵەبە / ğełebe/:** ☜ **غەڵەبایی**

**غــەڵــەت[1] / ğełet/:** نـاو. خەلـەت؛ سـەهو؛ هەڵـە. هەروەها: **غەڵەت کردن** ☰ غلط

**غــەڵــەت[2]:** ناوەلـناو. خەلـەت؛ نادروسـت ‹کـاری غەڵەت› ☰ غلط؛ نادرست

**غــەڵەتنامــە / ğełetname/:** نــاو. هەڵـــەنامە؛

نووسراوەیێ کە بە ڕیز هەڵەکانی کتێب یان بەرهەمێکی تێدا ڕاست کراوەتەوە ☰ غلطنامه

**غەڵەتناى / ğeletnay/**: چاوگ. خەڵەتاندن ☰ فریب دادن

**غەڵەتیاى / ğeletyay/**: چاوگ. خەڵەتان ☰ فریب خوردن

**غەڵێف / ğelêf/**: ☜ **خەڵێف**

**غەم / ğem/**: ناو. خەم؛ پەژارە (غەم، لە چوار کەنارە «مەسەل») ☰ غم

**غەمبار / ğembar/**: ئاوەڵناو. خەمبار؛ خەمین ☰ غمگین

**غەمباری / ğembarî/**: ناو. خەمباری؛ خەمینی ☰ غم و غصه

**غەمخۆر[1] / ğemxor/**: ناو. خەمخۆر؛ سەرپەرشت ☰ سرپرست

**غەمخۆر[2]**: ئاوەڵناو. ١. خەمین؛ دڵبەخەم ٢. جگەرسۆز؛ دڵسۆز ☰ ١. غمگین ٢. دلسوز

**غەمخۆرە / ğemxore/**: ناو. شاقە؛ شاقەشین؛ شاوە؛ شاهۆ؛ خەمخۆرە ☰ بوتیمار

**غەمزە / ğemze/**: ناو. ١. خەمزە؛ چاوبڕکێ؛ چاوبازی؛ بزاوی چاو و برۆ و ئەندامانی لەشی ژن بۆ بزواندنی جینسی پیاو ٢. ناز؛ نازوگۆز؛ ئینجە و فینجە ☰ ١. غمزە ٢. ناز

**غەمگین / ğemgîn/**: ئاوەڵناو. خەمین؛ غەمبار ☰ غمگین

**غەملاندن / ğemlandin/**: ☜ **خەملاندن-١**

**غەمڵ / ğeml/**: ☜ **خەمل-١**

**غەملیو / ğemlîw/**: ☜ **خەملاو-١**

**غەمناک / ğemnak/**: ☜ **خەمناك**

**غەنازیر / ğenazîr/**: ☜ **خەنازیر**

**غەنازیل / ğenazîl/**: ☜ **خەنازیر**

**غەنازیلە / ğenazîle/**: ☜ **خەنازیر**

**غەنە / ğene/**: ناو. کاری تۆپ لە مەیدان خستنە دەر ☰ عمل اوت کردن

**غەنی / ğenî/**: ئاوەڵناو. ١. دارا؛ دەوڵەمەن ٢. بە ئاوات گەیشتوو ☰ ١. دارا ٢. کامروا

**غەنیم / ğenîm/**: ناو. غەنیو: ١. خەنیم؛ نەیار؛ دوژمن ٢. کێبەرکێ‌کەر؛ هومال؛ هاوچاو ٣. حەریف؛ خەنیم ☰ ١. دشمن ٢. رقیب ٣. حریف

**غەنیو / ğenîw/**: ☜ **غەنیم**

**غەوارە / ğeware/**: ئاوەڵناو. بێگانە؛ نەناس؛ غەریبە (لە شارەکەت، کە ڕەمزی ئاسن و مەنارەیە/ مەلی ئەوین غەوارەیە «سوارە») ☰ بیگانه

**غەوارەیی / ğewareyî/**: ناو. نامۆیی؛ بیانەیی ☰ بیگانگی

**غەور[1] / ğewr/**: ناو. ١. ژەنگی تەنک لە سەر ئاوێنە ٢. قوپاویی زەوی ٣. زووخی ناو زام و کوان ٤. ڕەوتی چەقینە ناو زەلکاودا ٥. مژ و تەم ☰ ١. زنگار خفیف بر آینه ٢. فرورفتگی زمین ٣. چرک زخم و دُمل ۴. فرایند فرو رفتن در منجلاب ۵. مه

▣ **غەور بون**: ١. قوپانی زەوی ٢. ڕۆچوون بە زەویدا؛ بە زەویدا چەقین ☰ ١. فرورفتن زمین ٢. فرورفتن در زمین

**غەور[2]**: ئاوەڵناو. لێڵ؛ ناساف ☰ کدر

**غەورۆ / ğewro/**: ئاوەڵناو. کاول؛ وێران؛ دارماو ☰ ویران

**غەوس / ğews/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* فریاڕەس ☰ فریادرس

**غەوش / ğewş/**: ناو. خەوش؛ زەدە؛ زەغەڵی ☰ زده؛ عیب

**غەوغەو / ğewğew/**: ناو. بەرخەبەبە؛ بەرچێڵە ☰ غبغب

**غەوغەوە / ğewğewe/**: ناو. سووکەڵە خەو؛ سۆکەخەو؛ سەرخەو ☰ پینکی؛ خواب کوتاه

**غەیان / ğeyan/**: ☜ **خاین**

**غەیانەت / ğeyanet/:** ☜ **خەیانەت**

**غەیب / ğeyb/:** ئاوەڵناو. غەیو؛ نادیار؛ خەیب؛ خەف؛ دوور لە دەڤەری ئاگایی و زانست ‹عالەمی غەیب› ☰ غیب

◘ **غەیب بوون:** نادیار بوون؛ پێوار بوون ☰ غیب شدن

**غەیب زانین:** لە ڕازگەلی نهێنی ئاگادار بوون ☰ غیب دانستن

**غەیب کردن:** نادیار کردن؛ پێوار کردن ☰ غیب کردن

**غەیب گوتن:** لە ڕازی نهێنی خەبەر دان ☰ غیب گُفتن

**غەیبزان / ğeybzan/:** ئاوەڵناو. غەیوزان؛ ئاگا لە نادیاران ‹ئەوینە شێخی سەنعانی غەیبزان/ دەکاتە گاور و شوانی بەرازان «هێمن»›. هەروەها: **غەیبزانی** ☰ غیبدان

**غەیبوێژ / ğeybwêj/:** ناو. خەفزان؛ سرئوش؛ سیمیار؛ زانا بە نادیاران؛ ئەوەی لە نهێنی هەواڵ دەدا ☰ غیبگو

**غەیبەت / ğeybet/:** ناو. ١. پاشەملە؛ پاشملە؛ لەمەت؛ گاڵەگورت؛ خوسپ؛ خۆسپ؛ خراپەبێژی ئەم و ئەو لە نەبوونیاندا ٢. دۆخی نەبوونی کەس یان شتێک لە جێگەی دیاریکراودا ☰ ١و٢. غیبت

◘ **غەیبەت کردن:** ١. زەم کردن؛ پاشملە گوتن؛ لە نەبوونی کەسێکدا خراپ گوتنی ‹نەبووی، غەیبەتی تۆی دەکرد› ٢. نەهاتن بۆ شوێنێکی دیاریکراو ‹دوێنێ نەهاتییە کەلاس، غەیبەتت کرد› ☰ ١و٢. غیبت کردن

**غەید / ğeyd/:** ناو. تووڕەیی؛ ڕک؛ قین؛ خەید ☰ خشم

**غەیدین / ğeydîn/:** چاوگ. تووڕە بوون ☰ خشمگین شدن

**غەیر / ğeyr/:** ئامراز. جگە؛ بێجگە؛ خەیر؛ خەین ☰ غیر؛ جز

**غەیرە / ğeyre/:** ئاوەڵناو. نەخزم؛ بێگانە بە تایەفە ☰ غیر؛ ناخویشاوند

**غەیرەز / ğeyrez/:** پیت. بژ؛ بل؛ جگە؛ بێجگە ☰ جُز

**غەیز / ğeyz/:** ناو. ڕک؛ ڕق؛ قین؛ تووڕەیی ☰ خشم

**غەین[1] / ğeyn/:** ناو. ناوی عەرەبی پیتی هەژدەهەمی ئەلفبای زمانی کوردی ☰ غین؛ نام عربی هجدهمین حرف الفبای کُردی

**غەین[2]:** ئامراز. جگە؛ بڵ؛ بێجگە؛ خەین ☰ جُز؛ بجُز

**غەیو / ğeyw/:** ☜ **غەیب**

**غەیوزان / ğeywzan/:** ☜ **غەیبزان**

**غیرەت / ğîret/:** ناو. خیرەت: ١. ئازایی؛ بوێری؛ عەگیدی ٢. جوامێری؛ مێرخاسی؛ جەربەزە ٣. ناموس؛ شەرەف ☰ ١. شجاعت ٢. غیرت ٣. ناموس

◘ **غیرەت نواندن:** تێکۆشان بە ئازایی و نەترسییەوە ☰ شجاعت نشان دادن

**غیژ / ğîj/:** ناو. لوور؛ ڕەوتی بە نهێم لە بڵندییەوە بەرەو خوار بوونەوە ‹پیرەهەڵۆ غیژی جووچکان بوو!› ☰ شیرجە

◘ **غیژ کرن:** غیژ بوون؛ لوور هاتنە خوار ☰ شیرجە رفتن

**غیژ بوون:** ☜ **غیژ کرن**

**غیژەک / ğîjek/:** ناو. هەرچی لوور بێتەوە ‹ئەڤ بالافرە غیژەکە› ☰ هر چیزی کە در هوا شیرجە برود

**غێ / ğê/:** ناو. ناوی پیتی هەژدەهەمی ئەلفوبێی زمانی کوردی ☰ غ؛ هجدهمین حرف الفبای زبان کُردی

# ف

**ف** / f/: پــت. نیشــانەی نۆزدەهــەمین پــیتی ئــەلفوبێــی زمــانی کــوردی 🇸🇦 ف؛ نشــانەی نوزدهمین حرف الفبای کُردی

**ف** / fi/: ناو. نۆزدەهەمین پیتی ئەلفوبێـی زمـانی کوردی 🇸🇦 ف؛ نوزدهمین حرف الفبای کُردی

**فا** / fa/: ناو. قوماشـێکی ئاورێشـمینە 🇸🇦 پارچـەای ابریشمی

**فابریقە** / fabrîqe/: نـاو. کارخانـە؛ شـوێنێک بـە کەرستە و ماشینی پێویستەوە بۆ بەرهەمهێنـانی کالایەک 🇸🇦 کارخانە

**فابریک** / fabrîk/: ناوەلناو. ئەسلـی؛ تایبەتمەنـدی ئەو شتەی لە کارخانەی ڕاستەکی خۆیدا دروست کرابێ و دەسـتی دەغەلـی پـێ نەگەیشـتبێ 🇸🇦 فابریک

**فابڵ** / fabił/: ناو. نەزیلـە؛ ڕاز؛ کورتـە حیکایـەتی ئـەخلاقی کـە قارەمانـەکانی پتـر گـژ و گیـا و گیانەوەرانن 🇸🇦 فابل

**فات** / fat/: ناو. ڕەنگی ئاچوخ؛ ڕەنگی کاڵ 🇸🇦 رنگ روشن

**فاتالیسم** / fatalîsm/: ناو. بڕوا بـە چارەنووسـێکی ئەزەلی کە ڕووداوەکانی ژیانی هەموو گیانـدارانی لە پێشدا بڕیوەتەوە 🇸🇦 فاتالیسم

**فاتحا** / fat(i)ĥa/: ☜ **فاتیحە**

**فاتحاخوانی** / fat(i)ĥax(i)wanî/: ☜ **فاتیحەخوێنی**

**فاتحە** / fat(i)ĥe/: ☜ **فاتیحە**

**فاتحەخوانی**/ fat(i)ĥex(i)wanî/: ☜ **فاتیحەخوێنی**

**فاتحـــــــــەخوێنی** / fat(i)ĥex(i)wênî/: ☜ **فاتیحەخوێنی**

**فاتفاتـک** / fatfatik/: نـاو. ۱. ☜ **فـــاتمۆک** ۲. خەمەگرۆو 🇸🇦 ۱. ☜ **فاتمۆک** ۲. بُزمجە

**فاتک** / fatik/: ☜ **فاتمۆک**

**فاتمۆک** / fatmok/: ناو. فاتفاتک؛ فاتک؛ فاتنـک؛ یاکەریم؛ جۆرێـک کـۆتری سـەرچکۆلەی پشـت قاوەیی کاڵە، پاشەستۆی خەتی پێدا کشاوە، مـل و بەرزگی کاڵ، دەموچاوی شەرابی کاڵ و چاوی سوورە 🇸🇦 یاکریم

**فاتمـەدارو** / fatmedarû/: نــاو. فاتمـــەهاروو؛ هەنگەبــەر؛ گوڵەبەنۆشــەک؛ گوڵەبۆنەشــکە؛ هەرەموونە سیاوداری؛ ڕێحانەمێخەکی؛ گیایـەکی یەکساڵەی هەمیشە سەوزی عەتراوی بە گەڵای هێلکەیی و گوڵـی بنەوشـەوە کـە گـەڵاکانی بـۆ دەرمان دەشێ 🇸🇦 فرنجمشک

**فاتمەهارو** / fatmeharû/: ☜ **فاتمەدارو**

**فاتنک** / fatnik/: ☜ **فاتمۆک**

**فاتـەبارە** / fatebare/: نـاو. گیایــەکی گــەڵاپان و خۆڕسکە لە سـەر بـرینی دادەنـێن دەرکـی پـێ

دەکا، ڕیشەکەی وشک دەکەن و بۆ بۆنخۆشی، تێکەڵ تووتنی دەکەن ☰ گیاهی است

**فاتەبۆر** / fatebor/: ناو. فاتەبۆرە؛ جۆرێ گندۆرەی شینی درێژووکە ☰ نوعی خربُزه

**فاتەبۆرە** / fatebore/: ☜ **فاتەبۆر**

**فاتەتیر** / fatetîr/: ناوەڵناو. *[مەجاز]* بێئاوەزی دڵناسک ☰ ابله زودرنج

**فاتەڕەشک** / fateřeş(i)k/: ناو. سپڵ؛ ئەسپۆڵ؛ پەشاڕەش؛ تاڵ ☰ طحال

**فاتەڕەشە** / fateřeşe/: ناو. خاڵخاڵۆکە؛ ماماڵە؛ گوێرەکەسوورە ☰ کفشدوزک

**فاتیحە**[1] / fatîĥe/: ناو. فاتحا؛ فاتحە؛ فاتێحە؛ ئەلحەمد؛ یەکەمین سوورەی قورئان کە موسڵمانان لە پرسەدا دەیخوێنن ☰ فاتحه

**فاتیحە**[2]: سارستە. فاتێحە؛ فاتحا؛ فاتحە؛ وشەیەکە لە پرسەدا، بە دەنگی بەرز دەگوترێ کە بیسەران سوورەتی فاتیحە بخوێنن بۆ ڕۆحی مردوو ☰ فاتحه

**فاتیحەخوێنی** / fatîĥex(i)wênî/: ناو. فاتحاخوانی؛ فاتحەخوێنی؛ فاتحەخوانی؛ پرسە؛ پەرسە؛ سەرەخۆشی؛ ڕێوڕەسمی کۆڕی تازیە گرتن و فاتحە خوێندن و سەرەخۆشی کردنی موسڵمانان لە خاوەن مردوو ☰ فاتحەخوانی

**فاتێحە** / fatêĥe/: ☜ **فاتیحە**

**فاچەڵفیچ** / façelfîç/: ناوەڵناو. قیلەوقاچ؛ شەفتوور؛ لار ☰ أریب

**فارزک** / farzik/: ناوەڵناو. زۆرخۆر؛ فرەخوەر ☰ پُرخور

**فارس** / fars/: ناو. کەسێ کە زمانی زگماکی فارسییە ☰ فارس

**فارسزمان** / farsz(i)man/: ناوەڵناو. فارسیزمان؛ تایبەتمەندی کەسێ کە زمانی زگماکی فارسی بێ ☰ فارسیزبان

**فارسی**[1] / farsî/: ناو. ١. لە دەستە زمانگەلی ئێرانی کە زاراوەکانی لە ئێران، تاجیکستان، ئەفغانستان و پاکستان باوە ٢. زمانێ کە ئەوڕۆ بەشێکی گەورە لە خەڵکی ئێران قسەی پێ دەکەن ☰ ١و٢. فارسی

**فارسی**[2]: ناوەڵناو. پێوەندیدار بە فارسەوە ‹شەرواڵی فارسی؛ ئەدەبی فارسی› ☰ فارسی

**فارسیبڕ** / farsîbiř/: ناوەڵناو. شەفتووربڕ؛ بڕشتی شەفتوور ☰ فارسیبُر

**فارسیزمان** / farsîz(i)man/: ☜ **فارسزمان**

**فارش** / farş/: ناوەڵناو. چۆنیەتی بڵاو بوونەوەی نهێنی ☰ فاش

◻ **فارش کرن**: بڵاو کردنەوەی نهێنی ☰ فاش کردن

**فارشکری** / farşk(i)rî/: ناوەڵناو. بڵاو کراوەوەی نهێنی ☰ فاششده

**فارگۆن** / fargon/: ☜ **فەرغون**

**فارماکۆلۆژی** / farmakolojî/: ناو. دەرمانناسی ☰ داروشناسی

**فارن** / farin/: چاوگ. خوارن؛ خواردن ☰ خوردن

**فارنهایت** / farinhayt/: ناو. پلەکی پێوانی دەما، کە خاڵی بەسرانی ئاو ٣٢ ژوور سیفر، خاڵی کوڵانی ئاو ٢١٢ ژوور سیفر و خاڵی سیفرەکەشی بریتییە لە دەمای تێکەڵاوێکی بەفر و خوێ لە یەک ئەندازەدا ☰ فارنهایت

**فاڕای** / fařay/: چاوگ. گۆڕین؛ گۆڕان ☰ تغییر دادن

**فاڕایۆ** / fařayo/: چاوگ. گۆڕینەوە ☰ معاوضه کردن

**فاڕوگۆڕ** / fař û gor̄/: ناو. ئاڵوگۆڕ؛ ئاڵوویر ☰ مُعاوضه

**فاڕیای** / fařyay/: چاوگ. گۆڕدران ☰ تغییر یافتن

**فاز** / faz/: ناو. ١. بارودۆخێکی تایبەتی لە

خولێکی گۆڕانکاریدا ٢. بەشێکی دیاریکراو لە ڕەوتانەیێک ٣. بەشێکی هاوجۆر لە دەزگایەکی چەن‌جۆردا ٤. قۆناخێک لە بزاوێکی بازنەییدا ٥. بەش؛ پاژێکی دیاریکراو لە زنجیرە چالاکییەکی خانووبەرەسازیدا ☰ ١تا٥. فاز

**فازپێو / fazpêw/:** ☜ **فازمیتر**

**فازمیتر / fazmît(i)r/:** ناو. فازپێو؛ جۆرێ پێچ‌کوشتی بە لامپێکی بچووکەوە بۆ دەرخستنی گەڕانی کارەبا ☰ فازمتر

**فاست / fast/:** ناو. هەڵە؛ سەهو ☰ اشتباه؛ غلط

**فاستۆنی / fastonî/:** ☜ **فاسۆنی ـ١**

**فاسد / fasid/:** ئاوەڵناو. ١. گەنیو؛ گەنید؛ زنخ ‹میوەی فاسد› ٢. *[کینایە]* گەندەڵ؛ فەتکار؛ گەندکار؛ بە ئاکار و ڕەوشتی دزێو و دژ بە کۆمەڵ ‹مرۆی فاسد› ☰ ١و٢. فاسد

**فاسق / fasiq/:** ئاوەڵناو. سۆتە؛ داوشکەستی؛ خاوەن پێوەندی نارەوا لەگەڵ ژنی شوودار ☰ فاسق

**فاسڵە / fas(i)łe/:** ناو. مەودا؛ نێوان ☰ فاصله

**فاسولیا / fasulya/:** ☜ **فاسۆلیا**

**فاسونیا / fasunya/:** ☜ **فاسۆنی ـ١**

**فاسۆلیا / fasolya/:** ناو. فاسولیا؛ لۆبیا؛ لووبیا؛ قەلووکە؛ هولیرەباخی؛ دەنکی درێژووکەی لووبیا کە چەند جۆری هەیە و هەمووی دەخورێ ☰ لوبیا

**فاسۆن / fason/:** ☜ **فاسۆنی ـ١**

**فاسۆنی / fasonî/:** ناو. ١. فاستۆنی؛ فاسۆن؛ فاسۆنیا؛ پارچەی ئەستووری لە هەودای درێژ و ناسکی (زیاتر) خوری بە ڕووبەرێکی لووس و بێ‌پرزەوە بۆ کۆت و شاڵوار و ... ٢. ☜ **فاسونیا** ☰ ١. فاستونی ٢. ☜ **فاسونیا**

**فاش[1] / faş/:** ناو. جوێن؛ جنێو؛ دژمان؛ خۆسن ☰ فُحش؛ دُشنام

**فاش[2]:** ئاوەڵناو. ئاشکرابوو؛ دەرکەوتوو ☰ فاش

**فاشافاش / faşafaş/:** ئاوەڵکار. بێ‌پەردە؛ ئاشکرا ☰ آشکارا؛ بی‌پرده

**فاشل / faşil/:** ئاوەڵناو. ١. نەزۆک؛ نازا ٢. زڕ؛ بێبەر؛ بەبێ ئاکامی ڕەچاوکراو ٣. *[مەجاز]* سەرنەکەوتوو؛ تێکشکاو ‹حکوومەتی فاشل› ☰ ١. عقیم ٢. بی‌ثمر ٣. شکست‌خورده

**فاشە / faşe/:** ناو. *[ناشیرین]* جندە؛ جوونە؛ ڕووسپی؛ سۆزمانی ☰ فاحشه

**فاشەخوونە / faşexûne/:** ناو. *[ناشیرین]* جندەخانە ☰ فاحشه‌خانه

**فاشیزم / faşîzm/:** ☜ **فاشیسم**

**فاشیست / faşîst/:** ئاوەڵناو. هۆگر و لایەنگری ئامۆژەی فاشیسم ☰ فاشیست

**فاشیستی / faşîstî/:** ئاوەڵناو. پێوەندیدار بە فاشیسمەوە ☰ فاشیستی

**فاشیسم / faşîsm/:** ناو. فاشیزم؛ ئامۆژە، ڕاپەڕین یان ڕژیمێکی سیاسی لایەنگری ڕەگەزپەرستی یان گەلپەرستی، زۆرەملی و توند و تیژی لە ئاست نەیارانەوە ☰ فاشیسم

**فاعلە / fa'le/:** ناو. کرێکار؛ عەمەلە ☰ کارگر

**فاعیلاتون / fa'îlatun/:** ناو. بناغەیەکی کێشی شیعری عەرووزی ☰ فاعلاتُن

**فاعیلون / fa'îlun/:** ناو. بناغەیەکی کێشی شیعری عەرووزی ☰ فاعلُن

**فافۆن / fafon/:** ناو. ئالۆمینیوم؛ توخمێکی کانزایی زۆر سووک و پتەو، بە ژمارەی ئەتومی ١٣ و ڕەنگی سپی ئاماڵ خۆڵەمێشییەوە کە لە زۆر پیشە و پیشەسازیدا بەکار دەچێ ☰ آلومینیوم

**فاق / faq/:** ناو. ١. فاقە؛ جۆرێ داوی گیانلەبەر گرتن ‹هەر ناڵەناڵی دڵمە بە دەستی فیراقەوە/ وەک ڕێوییێ کە هەر دوو گونی بێ بە فاقەوە! «شێخ ڕەزا»› ٢. لق؛ لکە دار ٣. حاچە؛ لقی دووفلێقانە

٤. قەڵش؛ تلیش ٥. جۆرێ پارچەی ڕەش بۆ چارشێوی ژنان ٦. ڕاد؛ پەڕی تیری کەوان ٧. کۆمی؛ کووڕی ☰ ١. نوعی دام شکار ٢. شاخەی درخت ٣. ساقەی دوشاخه ۴. فاق؛ شکاف ۵. فاق؛ نوعی پارچەی چادر زنانه ۶. سوفار تیر ۷. خمیدگی

⊡ **فاق دان:** ١. چەمانەوە؛ کۆمەوە بوون ‹پیرەژن بە جارێ فاقی دابوو› ٢. *[کینایە]* لاواز بوون ٣. قەڵشان؛ تلیشیان ☰ ١. خمیدن ٢. لاغر شدن زیاد ٣. شکاف برداشتن

**فاقه** / faqe/: ☜ **فاق ـ١**

**فاک** / fak/: ناو. حیلە؛ گزی ☰ نیرنگ

**فاکتۆر** / faktor/: ناو. ١. پسوولە؛ سیاهە ٢. بۆنە؛ هۆ؛ هۆکار ☰ ١. کاغذ خرید ٢. عامل

⊡ **فاکتۆر گرتن:** ١. دەرهێنانی پسوولە ٢. پوختە کردن بە کورت کردنەوە ☰ ١و٢. فاکتور گرفتن

**فاکس** / faks/: ☜ **فەکس**

**فاکوفیک** / fak û fîk/: ناو. ١. فێڵوفەرەج؛ حیلەوحەواڵە ‹دیسان ئەو زوڕناوپیکە، دیسان ئەم فاکوفیکە «مەسەل»› ٢. خەیالاتی بەتاڵ ‹کە خۆت بڕوات هەیە بەم فاکوفیکە/ جەنابت بۆچ بە دنیا وا خەریکە؟ «جەنابی مەلا»› ☰ ١. نیرنگ ٢. خیال واهی

**فال** / fal/: ناو. ١. قولاپ و داوی ماسی گرتن ٢. فال؛ کاری بەخت خوێندنەوە ☰ ١. قلاب ماهیگیری ٢. فال

⊡ **فال گەکرن:** خیرە گرتنەوە لە لای فالچی ☰ فال گرفتن

**فالا** / fala/: ناوەلناو. بەتاڵ؛ خالی ☰ تُهی

**فالان** / falan/: ☜ **فلان**

**فالبین** / falbîn/: ☜ **فاڵگرەوە**

**فالبێژ** / falbêj/: ☜ **فاڵگرەوە**

**فالنج** / falinc/: ناو. ئیفلیجی؛ نەخۆشی شەپلە ☰ فلج اندام

**فالوده** / falûde/: ناو. پالوودە؛ فالوودە؛ خواردنێکە لە هەرشتەی نیشاستە، تێکەڵ بە شەربەتاو و ئارەقی بۆنخۆش کە لە گەرما و بۆ فێنکی دەیخۆن ☰ فالوده

**فاڵ** / fał/: ناو. ١. با؛ ئارەزووی مێوینەی یەکسم لە نێرەکەی ٢. خیرە؛ مروا؛ ڕۆدا؛ داخورت؛ کاری بەخت خوێندنەوە ٣. ☜ **ڕاوکە** ☰ ١. هوس جفتگیری ستور ماده ٢. فال ٣. ☜ **ڕاوکه**

⊡ **فاڵ دان:** کێشانی مێوینەی یەکسم لە فەحل ☰ گشن گرفتن

**فاڵ گرتن:** داگەڕانی مێوینەی یەکسم ☰ گُشن یافتن/ گرفتن

**فاڵ گرتنەوە:** ١. چوونە لای فالاوێژ ٢. بەخت خوێندنەوە ☰ ١و٢. فال گرفتن

**فاڵ هاتن:** وە/ بە فاڵ بوون؛ ئارەزووی نێر لە یەکسمی مێچکە پەیدا بوون ☰ نر خواستن ستور ماده

**وە/ بە فاڵ بون:** ☜ **فاڵ هاتن**

**فاڵاوێژ** / faławêj/: ☜ **فاڵگرەوە**

**فاڵچی** / fałçî/: ☜ **فاڵگرەوە**

**فاڵگر** / fałgir/: ☜ **فاڵگرەوە**

**فاڵگرەوە** / fałg(i)rewe/: ناو. فالبین؛ فالبێژ؛ فالاوێژ؛ فالچی؛ فالگەر؛ گیرزان؛ فالگر؛ قەپالگر؛ فیە؛ خێرە؛ خیپک؛ ئەوەی گوایە بە فاڵ داهاتوو دەبینێ ☰ رمّال؛ فالبین

**فاڵگەر** / fałger/: ☜ **فاڵگرەوە**

**فاڵنامە** / fałname/: ناو. ١. پەرتووکێ هەمە بابەتە لەمەڕ داهاتوو کە گوایە خەڵک بە خوێندنەوەی پەڕەیەکی داهاتووی خۆیانی تێدا دەبیننەوە ٢. پەڕەی چاپکراوێ کە ئەو شتانەی تێدا نووسراوە ☰ ١و٢. فالنامه

**فاڵودە** / fałûde/: ☜ **فالوده**

**فاڵە** / fałe/: ناو. پالە؛ کرێکاری دەشت ☰ برزگر

**فام / fam/**: ناو. فێم؛ فەهم؛ ئاوەز؛ چۆنیەتی تێگەیشتن ⊑ فهم؛ درک

▣ **فام کردن**: ☜ فامین

**فام کردنەوە**: شت فێر بوونی منداڵ ⊑ یاد گرفتن بچه

**فام گرتن**: ١. فامین؛ تێگەیشتن ٢. *[کینایە]* گەورە بوون ⊑ ١. فهمیدن ٢. بزرگ شدن

**فاما / fama/**: ☜ فامیدە

**فامان / faman/**: چاوگ. مسای؛ فێر بوون ⊑ آموختن

**فاماندن / famandin/**: چاوگ. تێگەیاندن؛ حالی کردن ‹تا فاماندم قیر سپی بوو!› ⊑ فهماندن

**فامانەوە / famanewe/**: چاوگ. تێگەیین؛ حالی بوون ‹بۆ پیالەی مەیلی لەیلی قەلبی مەجنوون قابیلە/ شۆڕشی شیرین لە نالەی کووهکەن فامایەوە «حەریق»› ⊑ فهمیدن

**فامای / famay/**: چاوگ. فامین ‹عاقلان دەور قەدیم ئەیامان/ یانەی دونیاشان وێنەی پول فامان «سەیدی»› ⊑ فهمیدن

**فامی / famî/**: ☜ فامیدە

**فامیدە / famîde/**: ئاوەڵناو. فاما؛ فامی؛ فامیە؛ تێگەیشتوو ⊑ فهمیده

**فامیل[١] / famîl/**: ناو. ١. بنەماڵە ٢. خاوخێزان ⊑ ١و٢. فامیل

**فامیل[٢]**: ئاوەڵناو. خزم؛ قەوم ‹پێکەوە فامیلن› ⊑ فامیل

**فامین / famîn/**: چاوگ. تێپەڕ. //فامیت؛ دەفامی؛ بفامە// فام کردن؛ تێگەیشتن ⊑ فهمیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: فامیو/ چاوگی نەرێنی: نەفامین

**فامیە / fam(i)ye/**: ☜ فامیدە

**فانتزی / fantizî/**: ☜ فانتێزی

**فانتێزی[١] / fantêzî/**: ناو. فانتزی؛ فەنتازیا؛ فەنتازی: ١. نەزیلەیەکی کورتی هەڵبژێردراو لە لایەنێکی پێکەنینی و ناعەقڵانی ژیان لە بارودۆخێکی خەیاڵیدا ٢. بەرهەمی هونەری لە خەیاڵاتی ئازادانە و بە دوور لە شێواز و ڕێبازی ناسراو ⊑ ١و٢. فانتزی

**فانتێزی[٢]**: ئاوەڵناو. فانتزی؛ فەنتازیا؛ فەنتازی؛ تازەباو؛ نۆباوە ‹ڕەنگی فانتێزی› ⊑ فانتزی

**فانسقە / fanisqe/**: ناو. فانوسقە؛ فانۆسقێ؛ ڕەخت؛ پشتێنەیەکی چەرمی یان برێزنتی بۆ هەڵواسینی فیشەکدان، سەرنێزە، قومقومە و چەکی کەمەری ⊑ فانُسقه

**فانوسقە / fanusqe/**: ☜ فانسقە

**فانۆز / fanoz/**: ☜ فانۆس

**فانۆس / fanos/**: ناو. فانۆز؛ فانووس؛ فەنەر؛ لەنتەر؛ چرادەستی؛ لەنتەری؛ چرایەکی پتر نەوتی سەرپۆشداری دەستی بۆ ڕووناکی دان لە دەر و دەشت ⊑ فانوس

**فانۆسقێ / fanosqê/**: ☜ فانسقە

**فانووس / fanûs/**: ☜ فانۆس

**فانی / fanî/**: ئاوەڵناو. بێبنیا؛ نەپایدار؛ بێدرێژە؛ بێدەوام؛ لە ڕێی نەماندا ‹بزانە دونیا فانییەن فانی/ ویەرد هەرچێت کەرد نە ڕووی نادانی «مەلا ئەحمەد کلاشی»› ⊑ فانی

**فانیلە / fanîle/**: ناو. ژێرکراس؛ ژێرشەوی ⊑ زیرپیراهن

**فایبرگلاس / faybirg(i)las/**: ناو. ڕیشاڵەی شیشەیی ناسک کە بری بەرهەمی پیشەسازی (وەک: پەشمەشیشە، دەزگ، پارچە و...ی) لێ دروست دەکەن ⊑ فایبرگلاس

**فایتوون / faytûn/**: ناو. فەیتوون؛ عەرەبانەی سواری کە ولاخ دەیکێشێ ⊑ دُرُشکه

**فایدە / fayde/**: ناو. فاییە؛ فەیدە؛ فەیدا؛ فیدە: ١. بەهرە؛ دەسهات؛ داهات ٢. قازانجی سەودا؛

خێری مامەڵە * هەروەها: **فایدە نەبوون؛ بێفایدە بوون** ⇇ ۱. بهره ۲. سود معامله

◽ **فایدە دان:** کەڵ هاتن؛ بە کار هاتن ⇇ بە کار آمدن

**فایز** / fayz/: ناو. سووی پارە ⇇ ربا؛ بهره

**فایزەن** / fayzen/: ناو. وڵاخێ کە پاشوان لێک دەدا ⇇ باربری که در راه رفتن پاهایش را به هم می زند

**فایق** / fayiq/: ئاوەڵناو. سەرکەوتوو؛ بە ئاوات گەیشتوو لە کاردا ⇇ پیروزمند؛ فایق

**فایل** / fayl/: ناو. ۱. دۆسیە؛ هەڤنقیس ۲. کۆمەڵێک زانیاری سەر بە یەکتر کە بە یەک ناو تۆمار کراون ۳. کابینێت؛ قەفەسەی بە نهۆم و درگاوە، بەتایبەت لە ئاشپەزخانە ⇇ ۱. پرونده ۲. فایل ۳. کابینت

**فاییە** / fayye/: ☜ **فایدە**

**فت**[1] / fit/: ناو. کام؛ نەفەس (لە سەبیلە و جگەرە و ...) ⇇ پُک (به چپق و سیگار و ...)

◽ **فت دان:** پف کردنی سەبیلە ⇇ فوت کردن در چُپُق

**فت کردن:** سەبیلە بە فوو بەتاڵ کردن ⇇ چُپُق را با فوت خالی کردن

**فت کرن:** ۱. ڕوانین؛ تماشا / نیگا کردن ۲. سەبیلە بە پف بەتاڵ کردن ⇇ ۱. نگاه کردن ۲. چُپُق را با فوت خالی کردن

**سەرپیکی قسە فت کردن:** *[مەجاز]* قسە و باسێکی دوور و درێژ دەسپێکردن ‹کە خەڵک بلاوەیان دەکرد، حەمەی مەولوود سەرپیکی قسانی فت دەکرد و قەت نەیدەهێشت تا وڵات ڕووناک دەبوو، چورتێک بدەم! «هەژار، چێشتی مجێور»› ⇇ سر صحبت را باز کردن

**فت**[2]: ئاوەڵناو. ۱. زۆر؛ فرە؛ زیاد ۲. گوشاد؛ هەراو ۳. قت؛ لە ڕیزی بازی دەرکراو ⇇ ۱. بسیار ۲. گشاد ۳. حذف شده از بازی

◽ **فت بوون:** ۱. دەرچوون لە ڕیزی بازی ۲. دەرپەڕین ⇇ ۱. از بازی حذف شدن ۲. بیرون پریدن

**فت کردن:** ۱. دەرکردن لە ڕیز ۲. لە دەمەوە هاویشتن ۳. شتێ لە ماڵی کڕدراو دەرکردن ⇇ ۱. از صف راندن ۲. از دهان بیرون انداختن ۳. چیزی از مبلغ کالای خریداری شده کاستن

**فت**[3]: دەنگ. وشەی گاڵتە پێکردن ⇇ کلمەی تمسخر

**فت**[4]: پێرۆ. ← **گزوفت**

**فتتو** / fittû/: دەنگ. فتوو؛ دەنگی لێخوڕینی بەرخ و کاریلە ⇇ صدای راندن برّه و کرّه‌بز

**فتخۆش** / fitxoş/: ئاوەڵناو. سەبیلەی نەفەسخۆش کە بە هاسانی مژی لێ بدرێ ⇇ چُپُقی کە پُک زدنش آسان است

**فتدان** / fitdan/: ناو. *[کینایە]* سی؛ جێ هەناسە ⇇ ریه

**فتراق**[1] / fitraq/: ناو. ۱. کار و ڕەوتی دانە پەی؛ بۆ گەڕان ۲. زراو؛ کیسەی زەرداو ⇇ ۱. جستجو؛ رصد ۲. زهره؛ کیسەی صفرا

◽ **لە فتراقا بوون:** بۆ گەڕان؛ هۆش دانە شتێ بۆ دۆزینەوەی ⇇ در جستجوی چیزی بودن

**فتراق**[2]: ئاوەڵناو. خۆ مات داو؛ لە سەر هەست ⇇ مُترصد

**فتراقکار** / fitraqkar/: ئاوەڵناو. ئاراگێل بە دوای شتێکدا ⇇ جستجوگر

**فتران** / fitran/: چاوگ. فتراندن؛ ڕوانین؛ تماشا کردن ⇇ نگاه کردن

**فتراندن** / fitrandin/: ☜ **فتران**

**فترک** / fitrik/: ناو. کارگ؛ کوارگ؛ قارچک ⇇ قارچ

**فترونە** / fitrûne/: ناو. شوێنی پەیوەند لە داردا ⇇

جای پیوند زدن درخت

**فتره** / fitre/: ناو. ڕبه؛ پێوانەیەک بەرامبەر بە چوار مست دەخڵ ☰ پیمانه‌ای برابر چهار مُشت غله

**فتفت** / fitfit/: ناو. سرته؛ پچه؛ پچەپچ ‹فتەفت ژنان، قەتلوعام مەردان «مەسەل»› ☰ پچ‌پچ

**فتق** / fitq/: ☜ فەتق

**فتلاندن** / fitlandin/: چاوگ. پێچ دان ☰ پیچ دادن

**فتلین** / fitlîn/: چاوگ. ١. پێچ دران ٢. ئاوڕ دانەوە ☰ ١. پیچ خوردن ٢. برگشتن

**فتنه**[١] / fitne/: ناو. فیتنه؛ ئاژاوە؛ بشێوە؛ پشێوی ☰ فتنه

**فتنه**[٢]: ناوەڵناو. فیتنە؛ ئاژاوەچی؛ سەرسوودەرە؛ خەمشێوێن ☰ فتنه‌انگیز

**فتوا** / fitwa/: ناو. دینا: ١. *[شەرع]* ئیجازە؛ بڕیار یان داوەری بە پێی قانوونی شەرع ٢. *[مەجاز]* داوەری و بڕیاری کەسێک لەمەڕ بابەتێکی دیاریکراوەوە ‹بەخوا کاکی خۆم بە فتوای من، بیخۆین بە خێری ساحیبی! «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ ١و٢. فتوا

◘ **فتوا دان:** ☜ **فتوا دەرکردن**

**فتوا دەرکردن:** فتوا دان؛ بڕیار دان بە پێی قانوونی شەرع ‹دەرسی فەقێ دەڵێتەوە و فتوای شەرعی دەردەکا «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ فتوا دادن

**فتوادەر** / fitwader/: ناو. دیناوەر؛ مفتی ☰ مُفتی

**فتوفراوان** / fit û f(i)rawan/: ☜ **فرەوفەراوان**

**فتۆکۆپی** / f(i)tokopî/: ☜ **فوتۆکوپی**

**فتو** / f(i)tû/: ☜ **فتو**

**فته**[١] / f(i)te/: ناو. چپە؛ چفە؛ سرته ☰ پچ پچ؛ درگوشی

**فته**[٢]: دەنگ. دەنگی بەتاڵ کردنی سەبیلە بە پف ☰ پُف

**فتەفت** / f(i)tefit/: دەنگەناو. ١. چپەچپ؛ سرتەسرت ٢. پتەپتی گڕی چرا ٣. کاری بۆن بە عەرزەوە کردنی سەگ ☰ ١. پچ ـ پچ ٢. پرش شُعله‌ی چراغ ٣. عمل بو کشیدن سگ روی زمین

**فته ـ فته** / f(i)tefit/: ☜ **فنەفن ـ٣**

**فتیله** / f(i)tîle/: ☜ **فتێلە**

**فتیلەچرا** / f(i)tîleç(i)ra/: ناو. قەندیلە؛ قەنیلە؛ قوتیلکەچرا ☰ چراغ موشی

**فتێلە** / f(i)têle/: ناو. فتیلە ١. پلیتە ٢. قودیلە چرا ☰ ١. فتیله ٢. چراغ موشی

**فجه** / ficce/: ☜ **فجووق**[١]

◘ **فجه کردن:** ☜ **فجووق کردن**

**فجوڕ** / f(i)cûř/: دەنگ. دەنگی فڕینی کاسەڵە و کەو ☰ صدای پریدن تیهو و کبک

**فجوز** / f(i)cûz/: ناو. فچۆز؛ تەرە؛ ڕەوتی ڕۆیشتنی بێ گەڕانەوە ☰ عمل رفتن بی‌بازگشت

**فجووق**[١] / f(i)cûq/: ناو. فججه؛ فچۆق؛ دیق ☰ دِق

◘ **فجووق کردن:** فججه کردن؛ دیق/ دیق کردن؛ زوقرە کردن؛ بە هۆی کوڵوکەسەری زۆرەوە تووشی نەخۆشین هاتن ‹لە بیستنی خەبەری تیرەبارانی کچەکەی فجووقی کرد و مرد› ☰ دق کردن

**فجووق**[٢]: دەنگ. فچۆق؛ دەنگی فڕینی کەو ☰ صدای پریدن کبک

**فجووقێن** / f(i)cûqên/: ناو. یارییەکی منداڵانە ☰ از بازی‌های کودکان

**فجوک** / f(i)cûk/: ناو. باڵندەی ئامادەی فڕین ☰ پرنده‌ی آماده‌ی پرواز

**فچ** / fiç/: ناوەڵکار. بەڵێ؛ شیرۆ؛ هەڵبەت ☰ البته

**فچک**[١] / fiçk/: ناو. حینچکە؛ کوت ☰ کله در جماع

**فچک**[٢]: دەنگ. دەنگی دەزگای جۆڵا لە کار کردندا ☰ صدای دستگاه بافندگی هنگام کار

**فچک‌فچک** / fiçkfiçk/: دەنگەناو. فچەفچ؛ فچکی بە شوێن یەکدا ☰ صدای پیاپی «فچک»

**فچکە** / fiçke/: ناو. تەرسەقول؛ قەرسەقول؛ سەرکل 🇮🇷 سرگین الاغ و استر و ...

**فچۆز**[١] / f(i)çoz/: ☜ **فجوز**

**فچۆز**[٢]: دەنگەناو. سیرە؛ چیرە؛ قیژەی کەو لە ترسان 🇮🇷 جیغ کبک از ترس

**فچۆزک** / f(i)çozik/: ناو. *[پلار]* ژنی بێشەرمی سەڵیتە 🇮🇷 زن سلیطه

**فچۆق** / f(i)çoq/: ☜ **فجوق**

**فچە** / f(i)çe/: ناو. پچە؛ چپە؛ سرتە 🇮🇷 پچ ـ پچ

**فچەفچ** / f(i)çefiç/: دەنگەناو. ١. پچەپچ ٢. فچکفچک 🇮🇷 ١. پچ‌پچ ٢. کلەی پیاپی در هنگام جماع

**فحێل** / f(i)ĥêl/: ناو. پاکانە؛ بێتاوانی 🇮🇷 تبرئه

**فدا** / f(i)da/: ئاوەڵناو. گۆری؛ قوربان؛ خۆ دە پێناو ناو 🇮🇷 فدا

**فدایی** / f(i)dayî/: ☜ **فیدایی**

**فدی** / f(i)dî/: ناو. فهێت؛ فەدی؛ شەرم 🇮🇷 شرم؛ آزرم

**فدیە** / fidye/: ☜ **فیدیە**

**فر** / fir/: ☜ **فڕ**[١]**ـ١**

⊡ **فر دان**: فڕین؛ باڵ گرتنەوە 🇮🇷 پرواز کردن

**فرار** / f(i)rar/: ناو. کاری هەڵاتن 🇮🇷 فرار

**فراز** / f(i)raz/: ئاوەڵناو. ١. گوشاد؛ هەراو ٢. بڵند؛ بەرز 🇮🇷 ١. فراخ؛ گشاد ٢. بلند

**فرازە** / f(i)raze/: ناو. فرێز؛ فرێزە؛ پەرێز؛ جێگەی دەغڵی درەوکراو 🇮🇷 جای غلەی درو شده

**فراژ** / f(i)raj/: ئاوەڵناو. فراژوو؛ فراژی؛ فەراژ؛ پێگەیشتوو؛ هەراش ‹گژ و گیا تەواو فراژ بوونە›.

هەروەها: **فراژ بوون** 🇮🇷 بالیده؛ رشدیافته

**فراژو** / f(i)rajû/: ☜ **فراژ**

**فراژی**[١] / f(i)rajî/: ناو. فەراژوو؛ فەراژی: ١. هەراشی؛ پێگەیشتوویی ٢. بووژانەوە؛ ڕەوتی لە سیسی و کزییەوە ساز بوون 🇮🇷 ١. بالندگی ٢. سرحالی بعد از زبونی

**فراژی**[٢]: ☜ **فراژ**

**فراغ** / f(i)rağ/: ناو. فراخ: ١. سەحنی نان خواردن ٢. فراق؛ ئامان؛ قاپ و قاچاغی ماڵ (بە گشتی) 🇮🇷 ١. ظرف گود غذاخوری ٢. ظروف خانه (عموماً)

**فراڤین** / f(i)ravîn/: ☜ **فراوین**

**فراق** / f(i)raq/: ☜ **فراغ-٢**

**فراقەت** / f(i)raqet/: ئاوەڵناو. ساخ؛ ساق؛ تەندروست 🇮🇷 تندرُست

**فراکسیون** / f(i)raks(i)yun/: ناو. تاقم؛ دەستە؛ دەستەیێ لە ناو پارت یا کۆمەڵێکی سیاسیدا کە ئەندامەکانی لەمەڕ چۆنیەتی بەڕێوەبردن و سیاسەتە گشتییەکانی حیزب، بیر و ڕای جیاوازیان هەیە 🇮🇷 فراکسیون

**فران** / f(i)ran/: ☜ **فلان**

**فرانسیوم** / f(i)rans(i)yum/: ناو. توخمی کیمیایی کانزایی ڕادیۆئەکتیو بە ژمارەی ئەتومی ٨٧ کە بە شێوەی دەسکرد و بۆ بوردمانی توریوم بەرهەم دێ 🇮🇷 فرانسیُم

**فرانک** / f(i)rank/: ناو. پارەی وڵاتانی فەڕانسە، بلژیک (پێش یورۆ)، سویس و چەند وڵاتی ئەفریقی بەردەستی پێشووی فەڕانسە 🇮🇷 فرانک

**فرانکەس** / f(i)rankes/: ☜ **فلانەکەس**

**فرانوفیستار** / f(i)ran û fîstar/: ☜ **فلانوفیسار**

**فرانەکەس** / f(i)ranekes/: ☜ **فلانەکەس**

**فرانی** / f(i)ranî/: ☜ **فلانی**

**فراوان** / f(i)rawan/: ئاوەڵناو. ١. زیاد؛ زۆر؛ فرە ‹نزار پڕ لە گوڵ، گوڵی فراوان/ سەوز و سوور و شین وەک دڵی لاوان «قانع»› ٢. گوشاد؛ هەراو ‹بەسەر دنیای فراوانا/ دەنگدانەوەی گۆرانیمان/ بە لاوانی گشت ڕووی زەوی/ ئەگەیەنێت برایمان «گۆران»› ٣. بەربلاو؛ بەرین ‹پایەت بڵند بۆ، سایەت فراوان/ پەی پەی کەردەی ڕەم دیدەی سیاوان «مەولەوی»›

ﷺ ١. فراوان ٢. فراخ؛ گشاد ٣. وسیع

**فراوانی** / f(i)rawanî/: ناو. ١. هەرزانی ڕسق و ڕۆزی ٢. هەراوی؛ گوشادی ﷺ ١. وفور ٢. فراخی؛ گشادی

**فراوین** / f(i)rawîn/: ناو. فراڤین؛ ژەمی نیوەڕۆ ﷺ نهار

**فرت**[1] / firt/: ناو. پت؛ کاری لێدانی ڕەگ ﷺ نبض

**فرت**[2]: ناوەڵناو. گوشاد؛ هەراو ﷺ گُشاد

**فرت**[3]: دەنگ. ١. فت؛ وشەی تیز پێ‌کردن ٢. دەنگی دەرچوونی شتێ ﷺ ١. کلمەی تمسخر و استهزاء ٢. صدای پریدن و دررفتن

**فرت**[4]: پێرۆ. ← **جرت‌وفرت**

**فرت**[5]: لێل. ← **فرت‌وفێلان**

**فرتاندن** / firtandin/: چاوگ. تێپەر. //فرتاندت؛ دەفرتێنی؛ بفرتێنە// فرتانن؛ دەرپەڕاندن ﷺ بیرون راندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەفرتاندن

**فرتانن** / firtanin/: ☜ **فرتاندن**

**فرتک** / firtik/: ناو. ١. فرمک؛ قولی بێقل؛ کونەکەپۆ؛ کونەتفنک؛ کونالووت ٢. چۆنیەتی دڵ بەیەکا هاتن ﷺ ١. سوراخ بینی ٢. تهوع

**فرتوفات** / firt û fat/: ناو. هاتوچۆی پەیتا ـ پەیتا ﷺ آمدوشد پیاپی

**فرتوفێلان** / firt û fêłan/: ناو. [پلار] فێڵ‌وفەرەج؛ گزی و حیله ‹هیچی جێ بڕوا نییە، فرت‌وفێلان دەکا› ﷺ نیرنگ

**فرتوهۆڕ** / firt û hoř/: ناو. فرک‌وهۆڕ؛ کار و ڕەوتی بزووتنەوە و چوون و هاتنی بێ‌ئۆقرە ﷺ ورجەوورجە

**فرتۆڵ** / firtoł/: ناوەڵناو. [پلار] فرتێ؛ جوێنی ژنانە بە مانای هەرزە (واتا: گوشاد) ﷺ خطابی اهانت‌آمیز بە زنان

**فرتونە** / firtûne/: ☜ **فەرتەنە ـ١**

**فرتونەک** / firtûnek/: ☜ **فەرتەنە ـ١**

**فرتە**[1] / firte/: ناو. ١. پرتە؛ قسەی بن لێو ٢. چۆنیەتی دەرپەڕینی شتێ بە توندی ٣. کار و ڕەتی بزووتنەوە ‹هەر فرتە بکەی لێت دەدا› ٤. چۆنیەتی ڕاتلەکانی توند ﷺ ١. غرولند ٢. ورجە ٣. جنبش ۴. پرش؛ لرزش شدید

◘ **فرتە کردن**: دەرپەڕین بە توندی و بە پەلە ‹مشکەکە فرتەی کرد و دەرچوو› ﷺ ورجهیدن

ـ **فرتە**[2]: پاشوشە. لەرە و تەکان ‹لاقەفرتە؛ لینگەفرتە› ﷺ لرزش و پرش

**فرتەفرت** / firtefirt/: ناو. ١. ڕەوتی چوون و هاتنی بێ نێوبڕ ٢. هات‌وچۆی لەپەستا ﷺ ١. ورجەوورجەی مُداوم ٢. رفت‌وآمد پیاپی

**فرتەنە** / firtene/: ☜ **فەرتەنە ـ١**

**فرتی** / firtî/: ناو. ١. دۆخی بزرکانی شیر؛ هەڵگەڕانی شیر ٢. ☜ **فرتیك** ﷺ ١. حالت فاسد شدن شیر ٢. ☜ **فرتیك**

**فرتیک** / firtîk/: ناو. فرتی؛ فردک؛ ورتکە نانی تێکوشین ﷺ ریزە نان ترید

**فرتێ**[1] / firtê/: ☜ **فرتۆڵ**

ـ **فرتێ**[2]: پاشوشە. کاری ڕاژاندن ‹پەلەفرتێ؛ لاقەفرتێ› ﷺ تکان

**فرتێنە** / firtêne/: ☜ **فەرتەنە ـ١**

**فرچ** / firç/: ناوەڵناو. پانەوەبوو؛ تلێقیاوە ﷺ لهیده

**فرچک**[1] / firçik/: ناو. فرسک؛ فرشک؛ فرێش؛ فرێشک؛ فرۆ؛ ژەک ﷺ آغوز

◘ **فرچک دران**: یەکەم شیری دوای هاتنە دنیاوە پێ دان ‹کوردی ئەو ناوە، کوردی تەواون/ وە شیری شێران فرچک دراون «هەژار، بۆ *کوردستان*»›. هەروەها: **فرچک دان** ﷺ اولین شیر پس از تولد را به خورد دادن

**فرچک کران**: ١. گۆچ کران؛ یەکەم جار کەوتنە بەر مەمکی دایک یان دایەنەوە ‹بە خوێندنەوە

کراوه فرچک گیانم/ زانسته مژیم و بۆته ئاو و نـانم «هــەژار، چوارینــەکانی خــەییام» ۲. [کینایـه] ڕاهاتن؛ فێر بـوون ‹بـه فەرهـەنگی کومۆنیسـتی فرچک کرابوون و هەر کەس چەپی نەبا بە خایـەن حیسـاب دەکـرا «هــەژار، چێشـتی مجێـور»›.

هەروەها: **فرچک کـردن** ≡ ١. برای نخستین بـار از شیر مادر یا دایه خورانده شدن ٢. تربیت شدن

**فرچک گرتن** یەکەمین جـاری مـەمک مـژینی منداڵی ساوا ‹مێژۆکم له مەمکی دایکم نەکردووه و فرچکم بە شیری دایـەن گرتـووه «هـێمن»› ≡ نخستین بار از شیر مادر یا دایه خوردن

**فرچک**[٢]: دەنگەناو. ١. حینچکـه؛ کـوت؛ فچـک ٢. دەنگی تێهەڵکەوتنی بێچوو لە گوانی دایـک بـۆ مژین ≡ ١. کله (جماع) ٢. صدای حریصانه مُک زدن کودک از پستان

**فرچه** / firçe/: ناو. فرشه: ١. تۆپه مـووی بـەداردا کوتراو بـۆ ڕەنـگ کـردن و خـاوێن کردنـەوه ٢. میسواک؛ فرچـەی ددان شـۆردن ≡ ١. فرچـه ٢. مسواک

**فرچەتاڵ** / firçetał/: نـاو. تەهلک؛ تەحلک؛ تاڵک؛ گرکەتاڵ ≡ خربُزه و طالبی نرسیده و تلخ

**فرچیل** / firçîl/: ناو. دانەوێڵەی نیوەکوڵاو ≡ دانەی نیم‌پخته

**فردانلن** / firdandin/: چـاوگ. هاڕین؛ ورد کـردن ≡ خُرد کردن

**فردقی** / fird(i)qî/: ناو. فـەرحانی؛ خۆشـی پـاش تەنگانه ‹پاشی تەنگیێ فردقییه «قسەی نەسـتەق»› ≡ فَرَج؛ گشایش پس از سختی

**فردک** / firdik/: ☜ **فرتیك**

**فردۆ** / firdo/: ناو. تریتی نان و دۆ ≡ تلیـت نـان و دوغ

**فردین** / firdîn/: چـاوگ. هاڕیان؛ ورد بوون ≡ خُرد شدن

**فرز**[١] / firz/: ئاوەڵناو. ١. زرک؛ زرنـگ؛ زرینـگ ٢. بەلەپا؛ خێرا لـه ڕێ ڕۆیشـتندا ٣. ڕێـکوپێـک و. لەبەرچاو ≡ ١. زرنگ ٢. بادپا ٣. شیک

**فرز**[٢]: ئاوەلکار. زوو ؛ بلەز ‹فـرزێ بچـۆ بیهێنـه!› ≡ زود؛ سریع

**فرزەند** / firzend/: نـاو. فەرزەنـد؛ ڕۆڵـه؛ چێلـه؛ بێچوو؛ منداڵ؛ زارۆ؛ زرۆ؛ زارۆله ≡ فرزند

**فرژین** / firjîn/: چاوگ. پـرمین؛ پرمـه کـردن ≡ نوعی صدا از بینی و لب درآوردن چهارپایان

**فرس** / firs/: ناو. فروزوو؛ فرووزوو؛ فرووزی؛ فریزوو؛ فریز؛ فرێز؛ فرێزوو؛ گیای چیمەن که بژارێکی زۆر دژواره ≡ فریز

**فرساده** / firsade/: ☜ **فرستاده**

**فرستاده** / f(i)ristade/: ئاوەڵناو. فرساده؛ ڕەوانەکراو ≡ فرستاده

**فرسـتقاندن** / f(i)rist(i)qandin/: چـاوگ. زەوت کردن؛ دەست بە سەردا گرتن ≡ ضبط کردن

**فرستقین** / f(i)rist(i)qîn/: چـاوگ. زەوت کـران؛ دەست بە سەردا گیران ≡ ضبط شدن

**فرسک** / firsik/: ☜ **فرچك**[١]

**فرسەت** / firset/: ناو. هـەل؛ دەرفـەت؛ فەرسـەت؛ فەرسەند؛ فرسەند ‹سەد حەیف که بۆ دەردی دڵـی من، دەمی وەسڵت/ فرسـەت کـەم و شـەو کورتـه و تووڵانییه مەتڵەب «ئەدەب»› ≡ فُرصت

▣ **فرسـەت هێنـان** دەرفـــەت دۆزینـــەوه بـــۆ ئەنجامدانی کارێ ≡ فرصت گیر آوردن

**بە فرسەت زانین** پەی بردن بـه هـەل و چـەلی گونجاو بۆ کردنی کـارێ ≡ فرصـت را مناسب دانستن

**فرسـەتباز** / firsetbaz/: ئاوەڵـناو. هەلپەرسـت ≡ فرصت‌طلب

**فرسەخ** / firsex/: ناو. فرسەق؛ فرسەنگ؛ فەرسەخ؛ مەودایەکی مێژینەی ڕێگایه بەرانبـەر بـه شـەش

کیلۆمیتر 🇮🇷 فرسخ

**فرسەق** / firseq/: ☜ **فرسەخ**

**فرسەند** / firsend/: ناو. ١. ئینساف؛ عەدالەت ٢. دەرفەت؛ کیس؛ هەل؛ فەرسەت 🇮🇷 ١. عدل؛ انصاف ٢. فُرصت

**فرسەنگ** / firseng/: ☜ **فرسەخ**

**فرشتە** / f(i)rişte/: ☜ **فریشتە**

**فرشتەنگ** / firşteng/: ناوەڵناو. کەمجیگڵدانە؛ تەنگەجیقەڵدان؛ بێحەوسەلە؛ کەمپشوو 🇮🇷 کمحوصلە

**فرشك** / firşik/: ناو. ١. ☜ **فرچك**[1] ٢. شیلاوک؛ ئامێژەن 🇮🇷 ١. ☜ **فرچك**[1] ٢. پنیرمایە

**فرشە** / firşe/: ☜ **فرچە**

**فرغ** / firğ/: ناو. زیپک؛ ئیراد 🇮🇷 ایراد

⊡ **بەفرغ**: زیپکگۆ؛ ئیرادگر ‹فلانکەس زۆر بەفرغە و کاری لەگەڵ دژوارە› 🇮🇷 ایرادگیر

**فرغون** / firğûn/: ☜ **فەرغون**

**فرغە** / firğe/: ناو. زیپکگۆیی؛ ئیرادگری ‹کابرایەکی زۆر بە فرغەیە، کاری لەگەڵ دژوارە› 🇮🇷 ایرادگیری

**فرفات**[1] / firfat/: ناو. پۆشەنی کرێکار لە کاتی کاردا 🇮🇷 لباس کار

**فرفات**[2]: ناوەڵناو. ڕزیو؛ پرتووکاو؛ پواو 🇮🇷 پوسیدە

**فرفاتە** / firfate/: ناو. کووتاڵی زۆر ناسک 🇮🇷 وال؛ پارچەی بسیار نازک

**فرقات** / firqat/: ناو. کولی گریانی لە سینگدا قەتیس ماو 🇮🇷 بُغض در گلو گیر کردە

**فرک** / firk/: ناو. ١. کاری بێچوو هێنان (تایبەتی بۆ ماینی دەڵێن) ٢. ژانی زان ٣. نەخۆشییەکی سنگە ٤. دەغلی تەنک؛ کێڵگەی کەمداهات ٥. کاری تەنک چاندنی تۆو ٦. مچورکی لەش 🇮🇷 ١. عمل بچە آوردن (مادیان) ٢. درد زایمان ٣. نوعی سینەدرد ۴. کشتزار کممحصول ۵. عمل با فاصلە کاشتن دانە ۶. مور مور بدن

⊡ **فرک بوون**: ماین زایین 🇮🇷 زاییدن مادیان

**فرکاندن** / firkandin/: چاوگ. هەڵپریواندن؛ پرواندن؛ ساوین و تەکاندن بە نیازی پاکەوە کردن 🇮🇷 خاک و گل از لباس زدودن

**فرکوهۆڕ** / firk û hoř/: ☜ **فرتوهۆڕ**

**فرم** / firm/: ☜ **فۆرم**

**فرمان** / firman/: ناو. ١. کار؛ ئیش؛ ئەرک ‹فرمان لە سارا، ڕۆن لە بەهارا «مەسەل»› ٢. عەمر؛ ئەمر ‹فرمانی شایان، نانی گەدایان «مەسەل»› 🇮🇷 ١. کار ٢. فرمان

**فرمانبەر** / firmanber/: ☜ **فەرمانبەر**

**فرمانکەر** / firmanker/: ناو. کرێکار؛ کارکەر 🇮🇷 کارگر

**فرمانگوزار** / firmanguzar/: ناو. کار پێکهێنەری بەردەستی دەسەلاتدار 🇮🇷 کارگُزار

**فرمانی** / firmanî/: ناو. جلک و کەلپەلی کار 🇮🇷 لباس کار

**فرمیسک** / firmîsk/: ☜ **فرمێسك**

**فرمیوم** / firm(i)yum/: ناو. توخمی کیمیاوی کانزایی ڕادیۆئەکتیڤ بە ژمارەی ئەتۆمی ١٠٠ کە بە شێوەی دەسکرد و لە بوردومانی پلوتونیوم بەرهەم دێت 🇮🇷 فرمیُم

**فرمێسک** / firmêsk/: ناو. فرمیسک؛ فریش؛ فرێشک ؛ ئەشک؛ ڕۆندک؛ ئەسر؛ ئەسرین 🇮🇷 اشک

⊡ **فرمێسکی شادی**: ئەسرینێ کە لە کاتی خۆشحاڵیدا هەڵدەوەرێ 🇮🇷 اشک شوق

**فرمێسکی گەش**: ڕۆندکی ڕوون 🇮🇷 اشک زلال

⊡ **فرمێسک باراندن**: فرمێک داوەراندن؛ فرمێسک ڕژاندن؛ فرمێسک ڕشتن؛ فرمێسک وەراندن؛ فرمێسک هەڵوەراندن؛ بەکول گریان و فرمێسک لە چاو هاتنە خوار 🇮🇷 اشک ریختن

چون ابر بهار

**فرمێسک داوەراندن:** ☜ **فرمێسك باراندن**

**فرمێسک داوەرین:** ☜ **فرمێسك ڕژان**

**فرمێسک ڕژان:** فرمێسک داوەرین؛ فرمیسک هەڵوەرین؛ ئەسرین هەڵوەرین ✉ اشک ریختن

**فرمێسک ڕژاندن:** ☜ **فرمێسك باراندن**

**فرمێسک ڕشتن:** ☜ **فرمێسك باراندن**

**فرمێسک وەراندن:** ☜ **فرمێسك باراندن**

**فرمێسک هەڵوەراندن:** ☜ **فرمێسك باراندن**

**فرمێسک هەڵوەرین:** ☜ **فرمێسك ڕژان**

**فرمێسکاوی** / firmêskawî/: ئاوەڵناو. هەرسین؛ ئەسریناوی ✉ اشک‌آلود

**فرمێسکبزە** / firmêskb(i)ze/: ناو. گریانی شادی ✉ اشک شادی

**فرنک** / f(i)rink/: ناو. تفنک؛ بێڤل؛ کەپۆ؛ کەپ؛ لووت ✉ بینی

**فرەوزوو** / f(i)ruzû/: ☜ **فرس**

**فروکتوز** / f(i)ruktuz/: ناو. قەندی میوە؛ هیدراتی کەربونی هەنگوین و مێوەی شیرین (وەک هەنجیر و توو) کە ماکێکی بێڕەنگە و دوو ئەوەندەی قەندی چەوەندەر شیرینە ✉ فروکتوز

**فرۆ** / f(i)ro/: ☜ **فرچك ١**

**فرۆتن** / f(i)rotin/: ☜ **فرۆشتن**

**فرۆتۆخ** / f(i)rotox/: ئاوەڵناو. فرۆشەر ✉ فروشنده

**فرۆتەنی** / f(i)rotenî/: ئاوەڵناو. ١. شیاوی فرۆتن ٢. ئامادەی فرۆتن ✉ ١و٢. فروختنی

**فرۆتی** / f(i)rotî/: ئاوەڵناو. فرۆشراو ✉ فروخته

**فرۆخت** / f(i)roxt/: ناو. ڕمێن؛ ڕەواج ✉ رواج

**فرۆز** / f(i)roz/: ناو. وەڕەزی؛ جاڕزی ✉ دلزدگی

**فرۆش**[1] / f(i)roş/: ناو. ١. ڕمێن؛ فرۆخت ٢. کاری فرۆتن ✉ ١. رواج ٢. فروش

**ـ فرۆش**[2]: پاشەوشە. فرۆشەر (پارچەفرۆش؛ کەمفرۆش) ✉ ـ فروش

**فرۆشتن** / f(i)roştin/: چاوگ. تێپەڕ. //فرۆشتت؛ دەفرۆشی؛ بفرۆشە// فرۆتن: ١. دان لە ڕەوتی دان‌وستاندا ٢. نواندن؛ نیشان دان (ناز فرۆشتن) ٣. شتێ بە هیوای شتێکی‌تر، بە شێوەیەکی ناشیرین و ناڕەوا دان (خۆ فرۆشتن) ✉ ١تا٣. فروختن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەفرۆشتن

**فرۆشران** / f(i)roşran/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //فرۆشرای؛ دەفرۆشرێی؛ بفرۆشرێ// فرۆشیان؛ گۆڕیانەوە بە پارە ✉ فروخته شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: فرۆشراو/ چاوگی نەرێنی: نەفرۆشران

**فرۆشراو** / f(i)roşraw/: ئاوەڵناو. فرۆشیاگ؛ فرۆشیاو؛ دراو لە دان‌وستاندا ✉ فروخته‌شده

**فرۆشگا** / f(i)roşga/: ناو. دوکانی گەورە ✉ فروشگاه

**فرۆشگە** / f(i)roşge/: ناو. موغازە؛ دوکان ✉ مُغازه

**فرۆشەر** / f(i)roşer/: ☜ **فرۆشیار**

**فرۆشیار** / f(i)roşyar/: ناو. فرۆشەر؛ کەسێ کە شت دەفرۆشێ ✉ فروشنده

**فرۆشیاگ** / f(i)roşyag/: ☜ **فرۆشراو**

**فرۆشیان** / f(i)roşyan/: ☜ **فرۆشران**

**فرۆشیاو** / f(i)roşyaw/: ☜ **فرۆشراو**

**فرۆک** / f(i)rok/: ئاوەڵناو. ڕەزاسووک؛ لەبەردڵان ✉ جذّاب

**فرۆیدیسم** / f(i)roydîsm/: ناو. ڕێبازێکی دەروون‌ناسی کە لە لایەن بژیشکی بەناوبانگی ئوتریشی، زیگموند فرۆیدەوە (١٨٥٦-١٩٣٩ ز.) دامەزرا ✉ فرویدیسم

**فروو** / f(i)rû/: ناو. ڕووناکی؛ ڕۆشنایی ✉ روشنایی

**فرووز** / f(i)rûz/: ناو. فرۆز؛ دۆخی تەنگ پێ هەڵچنین ✉ حالت در تنگنا قرار دادن

**فرووزوو** / f(i)rûzû/: ☜ **فرس**

**فرۆزی**[1] / f(i)rûzî/: ☜ **فرس**

**فرۆزی**[2]: ئاوەڵناو. ۱. زۆر وردیلە ۲. پیرۆزە ڕەنگ ☰ ۱. بسیار ریز ۲. فیروزە رنگ

**فرە**[1] / f(i)re/: ئاوەڵناو. فریە؛ زۆر؛ زاف؛ زەحف؛ گەلێک؛ زێدە؛ پڕ ‹زەحمەت فرەمان دا› ☰ بسیار

⊡ **فرە کردن**: زۆر کردنی شت و کار ‹ئیمسال ڕێواس فرەی کردگە›. هەروەها: **فرە بوون** ☰ افزایش یافتن

**فرە**[2]: ئاوەڵکار. فریە؛ زۆر؛ زاف؛ زەحف؛ گەلێک؛ زێدە؛ پڕ ‹فرە زەحمەتمان دا› ☰ بسیار

**فرە ـ**[3]: پێشوشە. زۆر؛ بە هەژمار یان ئەندامی زۆرەوە ‹فرەنەتەوەیی؛ فرەحیزبی› ☰ زیاد

**فرەبەش** / f(i)rebeş/: ناو. دارایی و داهاتێ کە زۆر کەسی تێدا شەریک بێ ☰ سهامی عام

**فرەبێژ** / f(i)rebêj/: ئاوەڵناو. فرەوێژ؛ زۆربلێ؛ چەنەباز؛ چەقەسرۆ. هەروەها: **فرەبێژی** ☰ پرگو

**فرەخوەر** / f(i)rexwer/: ئاوەڵناو. فرەخۆر؛ زۆرخۆر ‹فرەخوەر هەمیشە بار سکی ئەکێشێ «مەسەل»›. هەروەها: **فرەخوەری** ☰ پرخور

**فرەخۆر** / f(i)rexor/: ☜ **فرەخوەر**

**فرەخۆری** / f(i)rexorî/: ناو. پلتەخۆری؛ زۆرخۆری ☰ پُرخوری

**فرەڕوو** / f(i)reřû/: ئاوەڵناو. [پلار] ڕووبین؛ دووڕوو ☰ چند چهره

**فرەز** / f(i)rez/: ناو. پارچەیەکی جوانی تووکنە دەکرێتە پشتەکەوای ژنان ☰ مخمل

**فرەزان** / f(i)rezan/: ئاوەڵناو. فریەزان: ۱. زۆرزان؛ زانا ۲. [پلار] پێچ؛ گزیکار. هەروەها: **فرەزانی** ☰ ۱. دانا ۲. نیرنگباز

**فرەزانا** / f(i)rezana/: ئاوەڵناو. زۆر عالم؛ هۆزان ☰ فرزانە

**فرەقاندن** / f(i)reqandin/: چاوگ. فەرەقنای؛ لێکهەڵوەشاندن ☰ مُتلاشی کردن

**فرەقین**[1] / f(i)reqîn/: چاوگ. پەڕتین؛ لە بەر یەک چوون ☰ مُتلاشی شدن

**فرەقین**[2]: ئاوەڵناو. ڕقانی؛ ڕکئەستوور ☰ کینەتوز

**فرەگەڕ** / f(i)regeř/: ناو. گەڕاڵ؛ گەڕۆک ☰ سیّاح

**فرەلایەنی** / f(i)relayenî/: ☜ **پلورالیزم**

**فرەماگ** / f(i)remag/: ئاوەڵناو. کۆن؛ زۆرماو ☰ کهنه

**فرەواچ** / f(i)rewaç/: ئاوەڵناو. وڕاج؛ فرەبێژ؛ درێژدادڕ ☰ پُرچانە

**فرەوان** / f(i)rewan/: ئاوەڵناو. ۱. گوشاد؛ هەراو ۲. بەربلاو؛ هەمەلایەنە ‹خۆپیشاندانێکی فرەوان لە بەردەم پەرلەمان بەڕێوە چوو› ☰ ۱. گُشاد؛ فراخ ۲. وسیع

**فرەوانی** / f(i)rewanî/: ناو. ۱. گوشادی؛ فرتی ۲. بەربلاوی؛ هەمەلایەنی ‹فرەوانی دڵ› ☰ ۱. گُشادی ۲. وسعت

**فرەوفراوان**[1] / f(i)re w f(i)rawan/: ئاوەڵناو. فتوفراوان؛ زۆر و زەمەند ‹کار نییە و بێکاری فرەوفراوان!› ☰ فتوفراوان

**فرەوفراوان**[2]: ئاوەڵکار. فتوفراوان؛ زۆر و زەمەند ‹ئارەزوومەندیم جە حەد ویەردەن/ خەیلێ فراوان تاسەی تۆم کەردەن «مەولەوی»› ☰ فتوفراوان

**فرەوەڕ** / f(i)reweř/: ئاوەڵناو. ۱. تایبەتمەندی سەگێ کە زۆر ئەحەپێ ۲. [پلار] زۆربلێ؛ چەنەباز ☰ ۱. ویژگی سگی کە بسیار پارس می‌کند ۲. پُرگو

**فرەویست** / f(i)rewîst/: ☜ **زۆرخواز**

**فرەوێژ** / f(i)rewêj/: ☜ **فرەبێژ**

**فرەوێژی** / f(i)rewêjî/: ناو. ڕێسە؛ چەنەوەری ☰ پُرگویی

**فرەه**[1] / f(i)reh/: ئاوەڵناو. بەربلاو؛ پان و بەرین ☰ فراخ

**ـ فرەه**[2]: پاشەوشە. زۆر؛ فرە ‹بێنفرەه› ☰ زیاد

**فرەهی** / f(i)rehî/: ناو. ۱. ئاسوودەیی؛ تەناهی ۲.

هەرزانی ٣. کاری خۆش ڕابواردن ٤. بەربلاوی؛ گوشادی ☰ ١. آسایش؛ گشایش ٢. ارزانی ٣. خوشگذرانی ۴. فراخی

**فرەیەک / f(i)reyek/**: ئاوەلکار. قەیرێ؛ ماوەیەکی زۆر ‹فرەیەک ماتڵ بووین، نەهاتەوە› ☰ مُدت زیادی

**فرەیی / f(i)reyî/**: ناو. فراوانی ☰ فراوانی

**فریا / firya/**: ناو. فەریا: ١. ئاریکاری؛ هانا ٢. هاوار و داد ☰ ١. کمک؛ امداد ٢. داد و فریاد

▣ **فریا خستن**: پێگەیاندن؛ گەیاندن لە کاتی پێویستدا ‹نانم فریا خەن، مردم لە برسا!› ☰ رساندن در شرایط تنگ

**فریا کەوتن**: فریا گەیشتن: ١. دە هانا هاتن ‹ئەجەل دەستی من و داوێنی تۆ فریا کەوە زوو بێ!/ بە خۆم و ڕۆحمۆ حازر، لە بۆ ڕەددی بەلای کوردم «قانع»› ٢. دە کاتی پێویستدا گەیشتن ‹فریا نەکەوتم کەوشەکانم دەربێنم› ☰ ١. بە داد رسیدن ٢. در وقت مناسب رسیدن

**فریا گەیشتن**: ☜ **فریا کەوتن**

**دە فریا هاتن**: هاتنە هانەوە ‹هەمزاغا گوتی: کاک هەژار! بە نمەکی شێخی بورهانی، ئەو کەرانە خدری زیندە بوون دە فریامان هاتن! ئەتۆ دەڵێی چی؟ «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ بە یاری شتافتن

**فریادڕەس / firyadřes/**: ☜ **فریاڕەس**

**فریادڕەسی / firyadřesî/**: ☜ **فریاڕەسی**

**فریاڕەس / firyařes/**: ناو. فریادڕەس؛ فەریاڕەس؛ هەناڕەس؛ ئەوەی دەگاتە فریای هاوارکەرەوە ☰ فریادرس

**فریاڕەسی / firyařesî/**: ناو. فریادڕەسی؛ هانا ☰ فریادرسی

**فریاگوزار / firyaguzar/**: ناو. ئاریکار؛ یارمەتیدەر ☰ مددکار

**فریاگوزاری / firyaguzarî/**: ناو. کار و ڕەوتی بە هاناوە چوون ☰ امداد

▣ **فریاگوزاری سەرەتایی**: ئەو کارە دەرمانییانەی دەسبەجێ لە کاتی ڕوودانی کارەسات تا گەیشتنە نەخۆشخانە بۆ نەخۆش دەکرێ ☰ کمک‌های اولیه

**فریب / f(i)rîb/**: ☜ **فریو**

▣ **فریب خواردن**: ☜ **فریو خواردن**

**فریب دان**: ☜ **فریو دان**

**فریبخواردو / f(i)rîbx(i)wardû/**: ☜ **فریوخواردوو**

**فریبدراو / f(i)rîbd(i)raw/**: ☜ **فریودراو**

**فریبۆک / f(i)rîbok/**: ئاوەلناو. خاپینۆک؛ فریودەر ☰ فریبنده

**فریبیاگ / f(i)rîbyag/**: ☜ **فریودراو**

**فریبیان / f(i)rîbyan/**: ☜ **فریویان**

**فریچک / f(i)rîçik/**: ☜ **فریشك**

**فریز / f(i)rîz/**: ☜ **فرس**

**فریزر / f(i)rîzir/**: ناو. قەرسینک؛ بەفرینگ ☰ فریزر

**فریزو / f(i)rîû/**: ☜ **فرس**

**فریزێر / f(i)rîzêr/**: ناو. قەرسینک؛ بەفرینگ؛ کەرەستەی ڕچێنەری کارەبایی وەک یەخچاڵ، کە ماکی خۆراکی (زۆرتر گۆشت) دەڕچێنێ و ڕایدەگرێ ☰ فریزر

**فریسک / f(i)rîsk/**: ناو. گوڵێکە دەشتی لە بەهاردا دەڕوێ ☰ از گل‌های صحرایی که در بهار می‌روید

**فریشتە / f(i)rîşte/**: ناو. پەری؛ فرشتە: ١. *[دین]* خولاپەڕک؛ بوونەوەرێکی ئاسمانی کە دەگوترێ هێز و عەقڵی زۆرتر لە مرۆیە و کار و ئەرکی بەڕێوە بردنی فەرمانی خودایە ٢. *[مەجاز]* مرۆی خوێن‌شیرین و باش ٣. *[مەجاز]* زەری؛ کچی جوان و بێ‌گەرد ☰ ١تا٣. فرشته

**فریشک / f(i)rîşk/**: ناو. فریچک؛ شیلاوک؛ ئامیانی پەنیر ☰ پنیرمایه

▣ **فریشک کەوتن/ کەفتن:** بە ژەک کەوتن؛ نەخۆش کەوتنی منالی ساوا لە تەکان یان ترسان ☰ بیمار شدن بچەی قُنداقی

**فریشک گرتنەوە:** دەرمان کردنی منالی فریشک‌کەوتوو ☰ معالجه کردن کودک بیمار

**فریڤی** / f(i)rîvî/: ئاوەلناو. برژاو؛ کولاو ☰ پُخته

**فریقەت** / f(i)rîqet/: ئاوەلناو. خاترجەم؛ دلنیا ☰ مُطمئن

**فریک** / f(i)rîk/: ☜ **فەریک**

**فریو** / f(i)rîw/: ناو. گزی؛ فێل؛ فریو؛ گۆل؛ خاپ؛ لیپ؛ درۆ یان ناڕاستییێ کە بە جێی ڕاست نیشان بدرێ یان بگوترێ ☰ فریب

▣ **فریو خواردن:** فریب خواردن؛ خەلەتان؛ هەلخلەتان؛ دەسخەڕۆ بوون ‹تۆش بە رەنگ و بۆی ئەوان خواردت فریو؟/ چاوی تۆشی هەلفریواند زێڕ و زیو؟ «هێمن»› ☰ فریب خوردن

**فریو دان:** خەلەتاندن؛ خاپاندن؛ گۆلدان ☰ فریفتن

**فریوان** / f(i)rîwan/: ☜ **فریویان**

**فریواندن** / f(i)rîwandin/: چاوگ. فریو دان ☰ فریب دادن

**فریوباز** / f(i)rîwbaz/: ئاوەلناو. خاپینۆک ☰ حقه‌باز

**فریوخواردوو** / f(i)rîwx(i)wardû/: ئاوەلناو. فریب‌خواردوو؛ خەلەتاو؛ خاپاندی ☰ فریب‌خورده

**فریوخۆر** / f(i)rîwxor/: ئاوەلناو. فریب‌دراو ☰ فریب‌خورده

**فریودراو** / f(i)rîwd(i)raw/: ئاوەلناو. فریب‌دراو؛ فریبیاگ؛ فریوخواردوو؛ خاپاندی ☰ فریب‌خورده

**فریودەر** / f(i)rîwder/: ئاوەلناو. گۆلدەر؛ خاپێن ☰ فریب‌دهنده

**فریویان** / f(i)rîwyan/: چاوگ. فریبیان؛ فریوان؛ فریب خواردن؛ هەلخەلەتان ☰ فریب خوردن

**فریە** / firye/: ☜ **فرە**

**فریەزان** / firyezan/: ☜ **فرەزان**

**فرێت** / f(i)rêt/: ناو. پۆ؛ تێوەدان ☰ پود

**فرێز** / f(i)rêz/: ناو. ١. ☜ **فرس** ٢. ☜ **فرازە**

**فرێزوو** / f(i)rêzû/: ☜ **فرس**

**فرێزە** / f(i)rêze/: ☜ **فرازە**

**فرێش** / f(i)rêş/: ناو. ١. ☜ **فرمێسک** ٢. ☜ **فرچک‌ـ١**

**فرێشک** / f(i)rêşk/: ناو. ١. ☜ **فرمێسک** ٢. ☜ **فرچک‌ـ١** ٣. شیلاوک ☰ ١. ☜ **فرمێسک** ٢. ☜ **فرچک‌ـ١** ٣. پنیرمایه

**فرێکانس** / f(i)rêkans/: ناو. ١. هەژماری دووپات بوونەوەی یەک ڕووداو لە ماوەیەکی دیاریکراودا ٢. *[فیزیک]* هەژماری سیکلەکانی شەپۆلێک لە یەکەی کاتدا ☰ ١و٢. بسامد؛ فرکانس

**فڕ**[١] / fiř/: ناو. ١. فر؛ ڕەوتی بال لێکدان و بلند بوونی مەل ٢. بوختان و درۆ ‹نیوەی فرە و باقی ترە! «مەسەل»› ٣. پەیوەندی ‹توندوتیژی فڕی بە کوردەوە نییە› ٤. قوم؛ فڕ ‹ئای بۆ فڕێک قاوە!› ٥. جوێنی بە شیعر ٦. ☜ **فڕێ ـ٢** ٧. ☜ **فڕۆن** ٨. لوول؛ چین و دەق ٩. فڕموو؛ کەرستەیەکی کانزایی بۆ چین و دەق دانی موو ☰ ١. پرواز ٢. بُهتان ٣. ارتباط ٤. جُرعە ٥. هجو شعری ٦ ☜ **فڕێ ـ٢** ٧. ☜ **فڕۆن** ٨ حلقەی موو ٩. بابیلس

▣ **فڕ بە سەرەوە نەبوون:** هیچ پێوەندییەک لە نێواندا نەبوون ☰ هیچ ربطی نداشتن

**فڕ پێوە نەهێشتن:** هیچ بۆ نەهێشتنەوە؛ تەواو نسک‌وناهمێ کردن ☰ نیست و نابود کردن

**فڕ دان:** ☜ **فڕێ دان**

**فڕ سوار بوون:** *[مەجاز]* لە خۆ دەرچوون؛ خۆبایی بوون ☰ مغرور شدن

**فڕ کردن/ کرن:** هەلقوڕاندن؛ یەکجێ خواردنەوەی تراو ‹بەس گێژ بە لە ناو پێنج و

شەش و حەوت و چوار/ مەی فڕ کە دەتاوێتەوە وەک بەفری پار «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»
سر کشیدن

**فڕ هاتن:** بردنەوە؛ سەر کەوتن ‹ئەم دەسە ئێمە فڕ هاتین› بُردن بازی

**فڕ**[٢]: ئاوەڵناو. ١. ناسک و تەنک ٢. چیندار و لـوول ‹قژی فڕ› ١. نازک ٢. فِر

**. فڕ**[٣]: پاشەوشە. ـ پەڕ ‹بەرزەفڕ؛ قەلفڕ؛ کۆترفڕ› ـ پر؛ پرواز

**فڕ**[٤]: پێرۆ. ← **قڕوفڕ**

**فڕا / f(i)řa/:** ئاوەڵناو. ١. ڕفێنـدراو ٢. تیژبـاڵ؛ زۆر خێرا لـە فـڕین ٣. باڵـگرەوە ١. ربـوده شـده ٢. تیزپرواز ٣. بال‌زن

**فڕاخ / f(i)řax/:** ☜ **فراغ**

**فڕاکە / f(i)řake/:** ئاوەڵناو. جووچکە مەلێ کە تازە فێرە فڕین دەبێ جوجەی نوپرواز

**فڕان / f(i)řan/:** چاوگ. تێنەپەڕ. //فـڕای؛ دەفـڕێی؛ بفڕێ// فڕین: ١. باڵ گرتنەوە ٢. ڕفان؛ ڕفیـان ١. پریدن ٢. ربوده شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: فڕاو/ چاوگی نەرێنی: نەفڕان

**فڕاندن / f(i)řandin/:** چـاوگ. تێـپەڕ. //فڕانـدت؛ دەفڕێنی؛ بفڕێنە// فڕانن: ١. باڵ پێ گرتنـەوە ‹بـە تیرێک شەش چۆلەکەی لـە سـەر لقەکـە فڕانـد› ٢. ڕفاندن ‹شکاندی شیشەیی عەیش و نیشاتم، چـاوی سەححارت/ فڕاندی تاعەت و تەقوا و عیبادەت، زوڵفی زوننارت «زێوەر»› ١. پرواز دادن ٢. ربودن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەفڕاندن

**فڕان . فڕان / f(i)řan f(i)řan/:** ناو. ١. بـڕفین ـ بڕفین؛ کاری ڕفاندنی هـەر کەسـە بـۆ خـۆی ٢. کاری فڕەفڕ کردن ‹لە ناو ئەم سنگە خنکاوەی منا/ فڕان ـ فڕانـی پەراسـووەکانم بـوو «شـێرکۆ»› ١. مسابقه در ربودن ٢. عمل پر ـ پر زدن

**فڕانن / f(i)řanin/:** ☜ **فڕاندن**

**فڕاو / f(i)řaw/:** ئاوەڵـناو. ١. وەحـەوا کـەوتوو بـە باڵان ٢. ڕفێنراو ١. پرواز کرده ٢. ربوده شده

**فڕاوێژ / f(i)řawêj/:** ناو. فڕباز؛ کەسێ کە بە شێعر جوێن بە خەڵک دەدا هجّاء؛ هجو کننده به شعر

**فڕای / f(i)řay/:** چاوگ. فڕان؛ فڕین پرواز کردن

**فڕباز / fiřbaz/:** ☜ **فڕاوێژ**

**فڕتنای / fiřtnay/:** چـاوگ. فرتـە کـردن؛ تیـژ تێپەڕین ورجهیدن

**فڕفـڕۆک / fiřf(i)řok/:** نـاو. ١. ☜ **فڕفـڕە** ٢. پەپوولە ١. ☜ **فڕفڕە** ٢. پروانه

**فڕفڕۆکە / fiřf(i)řoke/:** ☜ **فڕفڕە**

**فڕفـڕە / fiřf(i)ře/:** نـاو. فڕفـڕۆک؛ فڕفڕۆکـە؛ لەیسـتۆکی لـە قاقـەز کـە لـە چەنـد لاوە دەنووشـتێتەوە و بەچێوێکییـەوە دەکـەن بـا دەیسووڕێنێ فرفره

**فڕفـڕی / fiřf(i)ři/:** ئاوەڵـناو. لـوول؛ گـرژ ‹قـژی فڕفڕی› فرفری

**فڕفینگ / fiřfing/:** ناو. ئەلامەت؛ هەلامەت؛ پەسیو زُکام

**فڕک / fiřk/:** ناو. ١. تـەنیا قومـێ؛ تـەنیا فـڕێ ٢. دۆخی بزاوتنی زۆر بە پەلە ٣. فـڕە؛ فـڕێ؛ تـووڕ؛ پەرت (لەگەڵ «دان»دا دەگوترێ) ‹خۆی فڕک دایـە باوەشم› ١. یک جُرعه ٢. حرکت بسیار سریع ٣. پَرت

⊡ **فڕک دان:** ☜ **فڕێ دان**

**فڕکا / fiřka/:** ناو. فڕک؛ کاری زۆر بە پەلە بـزاوتن گُریز

**فڕکا . فڕکا / fiřka fiřka/:** ناو. فـڕان ـ فـڕان؛ فڕکان ـ فڕکان؛ فڕکەفـڕک: ١. کـاری بـە پەلـە ڕاکردنی بـە کۆمـەڵ ٢. فـڕان ـ فـڕان؛ بـڕفین ـ بـڕفین ١. تاخـت و گریـز گروهـی ٢. مُسـابقەی ربودن

**فڕکان**[١] **/ fiřkan/:** چاوگ. ١. ڕاکردن بە کۆمەڵ ٢.

فڕان ـ فڕان کـردن ٣. گلـۆفین؛ گووشـین ☰ ١. گریختن گروهی ٢. ربودن ٣. در دست فشُردن

**فڕکان**[٢]: ناو. تاو؛ خێرایی؛ گورجی ‹بە فڕکان بچۆ بۆ ماڵی مە!› ☰ سرعت

**فڕکاندن / fiřkandin/**: چـاوگ. ١. گلـۆفین؛ گووشین ٢. فڕاندن ☰ ١. فشُردن ٢. ربودن

**فڕکان ـ فڕکان / fiřkin fiřkan/**: ☜ **فڕکا ـ فڕکا**

**فڕکراو / fiřk(i)raw/**: ناوەڵـناو. هەڵـقوڕاو؛ هەڵقۆڕیاگ ☰ سرکشیده

**فڕکوهۆڕ**[١] **/ fiřk û hoř/**: ناو. ١. کـاری بـە پەلـە ڕاکردن ‹منال لە دووی ئـەو شـێتانە فـڕکوهۆڕیـان بوو› ٢. هاتوچۆی بە پەلە ‹نێو بازاڕ فڕکوهۆڕێکە، وەستانی نییە› ☰ ١. دو با شتاب ٢. رفت‌وآمد سریع و پیاپی

**فڕکوهۆڕ**[٢]: دەنگەناو. دەنگی بەرد و داری بە تەوژم هاوێژراو ☰ صدای سنگ و چوب پرتاب شده

**فڕکە / fiřke/**: نـاو. ١. کـار و ڕەوتی دەرپـەڕین و ڕۆیشتنی توند و تیژ ‹چاوە و کـانی و ڕووبـاری زۆر ڕوون و تـەزی و بـەتـەوژم لـە بـەرزایی کەژانـەوە سەربەرەژێر فڕکەیانە و لە دەشت یەکتـر دەگرنـەوە «هەژار، *شـەرەفنامە*»› ٢. بازی زۆر بڵند ٣. سـاپ؛ سواپ؛ بەردی تەنک و لـووس ☰ ١. ورجهیـدن ٢. پرش بُلند ٣. شن صاف و نازک

⊡ **فڕکە هاتن**: نەوەستان؛ هیچ مەحتـەل نـەبوون ‹کتێبفرۆشی هەولێر و کـەرکووک و سولەیمانی نەدیدە کڕییان و ... زۆر زوو بە پێـنج دینـار هـەر فڕکـەی دەهـات «هـەژار، *چێشـتی مجێـور*»› ☰ توقف نکردن

**فڕکەفڕک / fiřkefiřk/**: ☜ **فڕکا ـ فڕکا**

**فڕگە / fiřge/**: ناو. ١. جێگەی باڵ گرتنەوەی مەل ٢. فڕۆکەخانـە؛ مـەتار ☰ ١. پروازگـاه پرنـدگان ٢. فرودگاه

**فڕمک / fiřmik/**: ☜ **فرتك ـ١**

**فڕمو / fiřmû/**: ناو. فڕ؛ کەرستەیەکی کـانزایی بـۆ چین و دەق دانی موو ☰ فرِ مو

**فڕمە / fiřme/**: ☜ **پرمە**

**فڕن / f(i)řin/**: ☜ **فڕۆن**

**فڕنای / fiřnay/**: چاوگ. فڕاندن ☰ پرواز دادن

**فڕندە / f(i)řinde/**: نـاو. فڕنـە؛ باڵـدار؛ پەلـەوەر؛ مەل ☰ پرنده

**فڕننە / f(i)řinne/**: ☜ **فڕندە**

**فڕنەگولە / fiřnegule/**: ☜ **فیسقە ـ١**

**فڕنی / fiřnî/**: ناو. خواردنێ لە شیر و ئاردەبرنج ☰ فرنی

**فڕوفیسار / fiř û fisar/**: ناو. فلان و بێهمان ‹ئەوان وەک ئێوە ناخۆن شەربەت و شـەکراو و پاڵـوودە/ لـە کوێ بێنن پـلاو و گۆشـت و خۆرشـت و فڕوفیسـار؟ «هێمن»› ☰ فلان و بهمان

**فڕوفیشاڵ / fiř û fişał/**: نـاو. درۆ و دەلەسـە ☰ چاخان پاخان

**فڕوفێڵ / fiř û fêł/**: ناو. فێڵوفەرەج ‹کیژی لادێیی نـەشمیلی جـوان چـاک! / بێ‌فـڕوفێڵ و هێـدی و داوێن‌پاک! «هێمن»› ☰ حیله و نیرنگ

**فڕۆک / f(i)řok/**: ناوەڵناو. فڕا؛ تیژباڵ ☰ تیزپر

**فڕۆکڤان / f(i)řokvan/**: ☜ **فڕۆکەوان**

**فڕۆکە / f(i)řoke/**: نـاو. تەیارە؛ بالافـڕ؛ کەرسـتەی گواسـتنەوە لـە هـەوادا کـە بـە کاردانەوەیـەکی دینامیکی لە هەوادا دەفڕێ ☰ هواپیما

**فڕۆکەئاژۆ / f(i)řoke'ajo/**: ☜ **فڕۆکەوان**

**فڕۆکەخانە / f(i)řokexane/**: نـاو. ١. فڕگـە؛ شـوێنێکی بـەربلاو بـە بانـدی فـڕین و ئـامێر و کەرسـتەی پێویسـت بـۆ فـڕین و نیشـتنەوەی فڕۆکە، وێڕای هەڵگرتن و داگرتنی بار و ڕێبوار ٢. گاراجی فڕۆکە ☰ ١. فرودگاه ٢. آشیانەی هواپیما

**فڕۆکەوان / f(i)řokewan/**: نـاو. فڕۆکڤـان؛ فڕۆکەئاژۆ؛ باڵـێنەوان؛ خەلـەبان؛ بالەفڕڤـان؛ ئـەو

کەسەی ئاژۆتنی فڕۆکەی بە ئەستۆیە. هەروەها: **فڕۆکەوانی** ≡ خلبان

**فڕۆن** / f(i)řon/: ناو. فڕ؛ فڕن؛ تەندووری بڵند ≡ فِر

**فڕۆنەک** / f(i)řonek/: ناو. بەرزەحەوایلە؛ بادەوە؛ کۆلارە ≡ بادبادک

**فڕووچ** / f(i)řûc/: ناو. فەرووج؛ فەرووچ: ١. جووجەڵە مریشکی خڕەکە کە بۆ خواردن ئەشێ ٢. *[کنایە]* مرۆی بچووک و لەڕولاواز ≡ ١. جوجەی مُرغ ٢. جوجه

**فڕووجاو** / f(i)řûcaw/: ناو. شۆرباوی فڕووج ≡ سوپ جوجه

**فڕە**[١] / f(i)ře/: ناو. فڕێ؛ برک ≡ گسیل

⊡ **فڕە دان**: ☜ **فڕێ دان**

**- فڕە**[٢]: پاشەوشە. کاری لێکدان (باڵ و شتی وا) ‹باڵەفڕە› ≡ کارِ برهم زدن (بال و ...)

**فڕە**[٣]: دەنگەناو. دەنگی باڵی مەل لە باڵ گرتندا ≡ صدای بال هنگام پرواز

⊡ **فڕە کردن**: لە شەقەی باڵ دان ≡ پرواز کردن

**فڕەدریاگ** / f(i)řediryag/: ☜ **فڕێدراو**

**فڕەدریاو** / f(i)řediryaw/: ☜ **فڕێدراو**

**فڕەفڕ**[١] / f(i)řefiř/: ناو. *[کنایە]* پەلەی زۆر ≡ شتاب

**فڕەفڕ**[٢]: دەنگەناو. دەنگی باڵ لێکدانی مەل ≡ صدای بال زدن

**فڕەک** / f(i)řek/: دەنگەناو. دەنگی باڵی مەل کە دێ بفڕێ ≡ صدای بال پرنده در شروع پرواز

**فڕەه** / f(i)řeh/: ناوەڵناو. ڤاڵ؛ گوشاد ≡ گُشاد

**فڕهاوێژ** / fiřhawêj/: ناوەڵناو. خراپەبێژ بە شیعر ≡ هجوسرا

**فڕهاوێژی** / fiřhawêjî/: ناو. کاری خراپە گوتن و جنێو دان بە خەڵک لە شیعردا ≡ هجوسرایی

**فڕیای** / fiřyay/: چاوگ. فڕان؛ باڵ گرتنەوە ≡ پرواز کردن

**فڕیفڕی** / f(i)ř f(i)řî/: ناو. بازییەکە بۆ منالان ≡ از بازی‌های کودکانه

**فڕین** / f(i)řîn/: چاوگ. تێنەپەڕ. //فڕیت؛ دەفڕی؛ بفڕە// ١. فڕان؛ باڵ گرتنەوە ٢. پتەدانی ڕەگ ٣. پەڕینی پەڵکی چاو ٤. پرمە و لووشە کردنی یەکسم لە برسان و ترسان ≡ ١. پریدن ٢. زدن نبض ٣. پریدن پلک چشم ۴. صدا درآوردن ستور از ترس و گرسنگی

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: فڕیو/ چاوگی نەرێنی: نەفڕین

**فڕیو** / f(i)řîw/: ناوەڵناو. هەڵفڕیو؛ باڵ لێکداو ≡ به پرواز آمده

**فڕێ** / f(i)řê/: ناو. ١. ڕەوانە؛ کاری ناردن ‹تووتنێ بۆ مە فڕێ بکە!› ٢. فڕ؛ فڕە؛ پەرت ≡ ١. گُسیل ٢. پرت

⊡ **فڕێ دان**: فڕ دان؛ فڕک دان؛ فڕە دان؛ فڕێ هەڵدان؛ توور دان؛ برک دان؛ برنگ دان؛ بایەخ پێنەدان؛ پێی قایل نەبوون ‹ماڵ و حاڵم بۆ چییە گەر میللەتم زیللەت بژی/ تاجی سەرشۆڕی فڕێ دە! تۆش وەکوو میللەت بژی «قانع»› ٢. حەوا دان ‹دا ئەو قەڵەمەم بۆ فڕێ دە!› ٣. بە هەرزان فرۆشتن ‹هەر فڕێی دەی سەد هەزار دەکا› ٤. وەلانان و ئاموشۆ نەکردن ‹خزم و کەسەکەشی فڕێیان داوە› ≡ ١. پرت کردن ٢. انداختن ٣. ارزان فروختن ۴. طرد کردن

**فڕێ هەڵدان**: ☜ **فڕێ دان**

**فڕێدراو** / f(i)řêd(i)raw/: ناوەڵناو. فەڕەدریاو؛ فڕەدریاگ؛ قەوانچە؛ بۆ دوور ئاوێژراو ≡ پرت شده

**- فڕێن** / f(i)řên-/: پاشەوشە. ١. هەوادەر ‹مەلفڕێن› ٢. ڕفێن ‹دڵفڕێن› ٣. وەخۆرەوە ‹مەیفڕێن› ≡ ١. ـ پرّان ٢. ـ رُبا ٣. ـ خواره

**فڕێندراو** / f(i)řênd(i)raw/: ناوەڵناو. ڕفاو؛ ڕفیاگ؛ ڕفێنراو ≡ ربوده شده

**فڕێن . فڕێن** / f(i)řên f(i)řên/: ناوەڵکار. کار و

کردەوەی بـڕفان ـ بـڕفان کـردن ‹لەشـکر وروژا، سوار فڕین ـ فڕین/ کەوتـە شـوێنی سـوار ئـاوزەنگی تەقێن «گۆران»› ⚑ عمل ربودن

**فز / fiz/**: ناو. فزە: ١. جوولە؛ بـزاو ٢. هەناسـە ⚑ ١. حرکت ٢. نفس

**فزدوک / fizduk/**: ☜ **فزدەڵە**

**فزدەڵە / fizdełe/**: نـاو. فزدوک؛ عازەبی ⚑ جـوش جوانی

**فزدی / fizdî/**: ناو. باڵدارێکی چکۆلەیە ⚑ پرنـدەای است

**فززە¹ / fizze/**: ناو. ١. ☜ **فز** ٢. جۆرێ نەخۆشی پەز ⚑ ١. ☜ **فز** ٢. نوعی بیماری گوسفند

**فززە²**: دەنگەناو. دەنگی بێڤلی گرتی ⚑ صدای بینی گرفته

**فـزوول / f(i)zûl/**: ناوەڵـناو. خۆتـێ‌هەڵـقوتێن؛ لاپرەسەن؛ لاپرەسەنگ؛ لاپلەرسەنگ؛ لاپـلار ⚑ فضول

**فزوولی / f(i)zûlî/**: ناو. کاری خۆتێ‌هەڵقوتاندن ⚑ فضولی

**فزە¹ / f(i)ze/**: ناو. جوولە؛ جمە ‹فـزەی بـری› ⚑ حرکت

⊡ **فزە لێ برین**: لـە جوولـە خسـتن ⚑ از حرکـت انداختن

**فزە²**: دەنگەناو. نکە؛ دەنگی بە حاڵ؛ سـرتەی کـەم ‹فزەی نایێ› ⚑ کمترین حرکت یا صدا

⊡ **فزە نەکردن**: دەنگ نەکردن؛ هەناسە نەدان لـە ترسان. هەروەها: **فزە نەهـاتن** ⚑ لب از لـب بـاز نکردن

**فزی / f(i)zî/**: پێرۆ. ← **دزی‌وفزی**

**فـژو / f(i)jû/**: نـاو. ١. *[شـوورەیی]* گـوو؛ پیسـایی بنیادەم ٢. *[مەجاز]* مرۆی زۆر پیس و پۆخڵ ⚑ ١. مدفوع ٢. آدم بسیار کثیف و شلخته

**فس¹ / fis/**: ناو. ١. *[شـوورەیی]* تس؛ بـای بێـدەنگێ کـە لـە ڕیخۆڵـەوە فـت دەبـێ ٢. پـس؛ کـاری خەوتنی مریشک لـە بـن کەڵەشـێردا ٣. *[مەجاز]* لووتبەرزی ⚑ ١. چُس ٢. عمل خوابیـدن مـرغ زیـر خروس ٣. غرور

⊡ **فس بەردان**: *[شوورەیی]* فس کردن؛ فس کەندن؛ تس کەندن؛ تس دانەوە؛ تسین ⚑ چُسیدن

**فس پێ دانـەوە**: *[پـلار]* پەشـیمان کردنـەوە ⚑ پشیمان کردن

**فس خواردن**: فس دادان: ١. دانـەوینی مریشـک بۆ کەڵەشـێر ٢. *[پلار]* دەسـت نەکردنـەوە لـە بەرانبـەر کەسـێکدا ٣. *[پلار]* ژێـر کـەوتن لـە زۆراندا ⚑ ١. خوابیدن مرغ زیر خروس ٢. مقاومت نکردن و شکست را پذیرفتن ٣. زمین خـوردن در کُشتی

**فس دادان**: ☜ **فس خواردن**

**فس دان**: ١. *[شـوورەیی]* تسین؛ تـس کەنـدن ٢. *[پلار]* ژێر خستن لە زۆراندا ٣. *[پلار]* بردنەوە لە قوماردا ٤. دانەوینی مریشک بۆ کەڵەشێر ⚑ ١. چُسیدن ٢. بر زمین زدن حریف در کُشتی ٣. بُردن در قمار از کسی ۴. خوابیدن مرغ زیر خروس

**فس کردن**: ☜ **فس بەردان**

**فس کەندن**: ☜ **فس بەردان**

**فس نیشتنەوە**: *[پلار]* بـا دەرچـوون؛ لـە هـەوا و لووتبەرزی کەوتن ⚑ از تکبُر افتادن

**فس²**: دەنگ. ١. وشەی گاڵتە پێ‌کردن ٢. دەنگـی خاڵی بوونەوەی با لە دەرز و کونێکی تەنکەوە ٣. دەنگێ بۆ دەرکردنی پشیلە ⚑ ١. کلمەی اسـتهزاء ٢. فِس؛ صدای خالی شـدن بـاد ٣. پیشـت؛ کملـەی راندن گُربه

⊡ **فس لێ کردن**: دەرکردنی پشیلە ⚑ پیشت کردن گربه

**فسار / f(i)sar/**: ناو. دەسکەڕەشمە؛ پـەتێ کـە دە ملـی حـەیوان دەخـرێ و پێـی ڕادەکێشـرێ ⚑

افسار؛ مهار

**فساندن** / f(i)sandin/: چاوگ. ۱. کوور کردنـەوە؛ داهێنانـەوە ۲. *[شـوورەیی]* تـس پـێ کەنـدن ۳. نیشـتاندنەوەی هەڵامساوێ ☰ ۱. خـم کـردن ۲. چُساندن ۳. خواباندن ورم

**فست** / fist/: ناو. بەرەکەت؛ پیت ☰ برکت

**فستاق** / fistaq/: نـاو. هـەنگوورێ کـە بـە دارەوە وشک بێ ☰ انگوری که بر تاک بخشکد

**فستان** / fistan/: ناو. کراسی ژنانە ☰ پیراهن زنانه

**فستق** / fistiq/: ناو. پستە؛ پسە ☰ پسته

**فستقان** / fist(i)qan/: چاوگ. لە بـەر لووسـی لـە دەست خزین ☰ لیز خوردن در دست

**فستک** / fistik/: ☜ فستەك

**فستوقی** / fistûqî/: ناوەڵناو. ۱. چـەورە؛ نەوسـنی ماڵانگـەڕ و بێکـارە ۲. ماڵانگـەڕێ کـە قـەت ناچێتەوە ماڵی خۆی ☰ ۱. شـکم‌پرسـت بیکـارە ۲. ولگرد

**فستەک** / fistek/: ناو. فستک؛ ڕەوتی ڕەت بردن و کەوتن بە سەر سەردا ☰ عمل سکندری خـوردن و با سر به زمین افتادن

**فستەی** / fistey/: چـاوگ. خسـتن؛ هاویشـتن ☰ انداختن

**فستیواڵ** / fistîwał/: ناو. مێهرەجان؛ میهرەگان ☰ جشنواره

**فس‌دومان** / fisdûman/: ناو. ۱. ژووری پڕ لە هەڵم و دووکەڵ ۲. ژوورێ کە کۆمەڵێ جگەرەی تێـدا دەکێشن ☰ ۱. اتاق پُر از دود و بُخـار ۲. اتـاقی کـه همه در آن سیگار می‌کشند

**فسـفس‌پاڵەوان** / fisfispałewan/: نـاو. *[پـلار]* خۆهەڵکێشی هیچ لە دەست نـەهاتوو ☰ پهلـوان پنبه

**فسقانج** / fisqanc/: ناو. جۆرێ قالۆنچەیە لـە کلـۆ دەکا، بە دارانەوە دەنیشـێ و کاتێـک دەکەوێتـە سەر زەوی فسەفسی دێ ☰ نوعی سوسک بالدار

**فسقل** / fisqil/: ناو. گزگل؛ بەرێکی دارمـازوو ☰ آز ثمرهای مازوج

**فسقە** / fisqe/: ☜ فسکە

**فسک** / fisk/: ناو. خلیسک؛ شەمت ☰ لغزش

**فسکاگورێ** / fiskagurê/: نـاو. گیایەکـە بـۆنێکی ناخۆشی لێ دێ ☰ گیاهی بدبو

**فسکاندن** / fiskandin/: چاوگ. پێدا فسین؛ سـوار بوونی مەلی نێر لە مێچکە ☰ سوار شـدن پرنـدەی نر بر ماده

**فسکول** / fiskul/: نـاو. ۱. پـرزەی وردی سـەر گەنمەشانی ۲. گوڵینگەی بەپـرزەی کـڵاو ☰ ۱. پُرز سر ذُرت ۲. منگولەی سر کُلاه

**فس‌کوڵیـو** / fiskułîw/: ناوەڵـناو. *[مـەجاز، پـلار]* تس‌کوڵیو؛ تەمەڵ و تەوەزەل ☰ تنبل و بیکاره

**فسکە** / fiske/: ناو. خسکە؛ خلیسکە؛ فسقە ☰ پیاز ریز کاشتنی

**فسکەفسک** / fiskefisk/: ناوەڵکار. پسەپس؛ بە شلی و زۆر لەسەرخۆ ‹فسکەفسک کار دەکا!› ☰ سـلانه ـ سلانه

**فسکەن** / fisken/: ناوەڵـناو. *[شـوورەیی]* فسـن: ۱. تسکەن؛ تسن ۲. *[پلار]* خوێڕی و ترسەنۆک ☰ ۱. چُسو ۲. بیکاره و ترسو

**فسکین** / fiskîn/: چاوگ. خلیسکان؛ خزیان ☰ لیـز خوردن

**فسن** / f(i)sin/: ☜ فسکەن

**فسنان** / fisnan/: چـاوگ. *[پـلار]* وەدەر نـان بـە سووکایەتی ☰ بیرون کردن

**فسنای** / fisnay/: چاوگ. *[شوورەیی]* فس پێدان ☰ چُساندن

**فسنجان** / fisincan/: نـاو. جۆرێـک خۆرشـت لـە گۆشـت، گـوێزی هـاڕدراو ، ڕوبی هـەنار و تامەچێشتی تر ☰ فسنجان

**فسنۆک / fisnok/:** ئاوەڵناو. *[شووره‌یی]* ١. تسـکەن ٢. ترسەنۆک ≡ ١. چُسو ٢. ترسو

**فسۆس / f(i)sos/:** ناو. ١. جانەوەرێکی بەڵـەک لـە تیرەی سنجاو، بۆگـەنێکی پیسـی لـێ دێـت ٢. *[کینایە]* مرۆی خوێڕی و بێکارە ≡ ١. سنجاب بـدبو ٢. آدم بیکاره

**فسۆک / f(i)sok/:** ئاوەڵناو. *[شووره‌یی]* تسن؛ تسکەن ≡ چُسو

**فسۆن / f(i)son/:** ناو. ئەسپی ئاوی ≡ اسب آبی

**فسه[1] / f(i)se/:** ناو. چپە؛ پچە ≡ درگوشی

◘ **فسه کردن:** سرتە کردن ≡ پچ ـ پچ کردن

**فسه[2]:** ☜ **فسەزمان**

**فسەزمان / f(i)sez(i)man/:** ئاوەڵـناو. فســە؛ تــور؛ پسک؛ لاڵەپەتە؛ زمانپسک ≡ الکن

**فسەفس[1] / f(i)sefis/:** ناو. *[پلار]* سســتی؛ کەهاڵـی ‹ئەونە فسەفست کرد بەجێ ماین!› ≡ سُستی

**فسەفس[2]:** ئاوەڵکار. پسەپس؛ بەشلی و زۆر لەسەرخۆ ‹فسەفس خەریکی چەیت؟!› ≡ سلانه ـ سلانه

**فسەفس[3]:** دەنگەناو. ١. پچەپچ؛ چپەچپ ٢. دەنگی با لێ دەرچوونی پفدراو ≡ ١. پچ ـ پـچ ٢. صـدای خالی شدن باد چیزی

**فسـەک / f(i)sek/:** ئاوەڵـناو. *[پـلار]* ترســـەنۆکی بێغیرەت ≡ ترسو و بی‌غیرت

**فسەی‌فسه / f(i)sey f(i)se/:** ناو. مووروی شـیلان ≡ مُهرەی زینتی

**فسیان / fisyan/:** ☜ **تسین**

**فسیای / fisyay/:** چاوگ. فس خواردن: ١. پسـان ٢. چەمین ≡ ١. گسستن ٢. خم شدن

**فسین / f(i)sîn/:** چاوگ. *[شووره‌یی]* تسـین؛ فـس کەندن ≡ چُسیدن

**فش[1] / fiş/:** ناو. چلم ≡ خُلم

**فش[2]:** ئاوەڵناو. ١. گوشاد؛ هەراو؛ فرت ‹پاتۆلی فـش باوە› ٢. شل و سست و ناپتەو ‹ئێرە خاکی فشـە› ≡ ١. گُشاد ٢. شُل و سست

◘ **فش بوون:** ١. فرت بوون ٢. شل و سست بـوون ٣. *[کینایە]* خۆ بە دەستەوە دان ≡ ١. گُشاد بودن ٢. سست و شُل بوون ٣. تسلیم شدن

**فش کردن:** ١. گوشاد کردن؛ فـرەوان کـردن ٢. *[کینایە]* خۆ بە دەستەوە دان ≡ ١. گُشاد کردن ٢. تسلیم شدن

**فش[3]:** دەنگەناو. کاری دەرخستنی پفی ناو دەفـری با تێکراو ≡ عمل خالی کردن باد ظرف باد شده

◘ **فش بوون:** با دەرچوون ≡ باد در رفتن

**ـ فش[4]:** پاشەوشە. ـ شۆڕ و خوارەگر ‹سمێلفش› ≡ شُل و آویزان

**فش[5]:** پێرۆ. ← **کەش‌وفش**

**فش[6]:** لێل. ← **فش‌وفۆڵ**

**فشار / f(i)şar/:** ناو. ١. قسەی بێجـێ ٢. گوشـار ≡ ١. هذیان ٢. فشار

**فشارای / f(i)şaray/:** چاوگ. گوشین ≡ فشُردن

**فشافش / f(i)şafiş/:** نـاو. کاری هەناسەدانی بەپەلە و لەسەریەک ≡ عمل هِن‌هِن کردن

**فشـاندن / f(i)şandin/:** چـاوگ. چەمانـــدن؛ چەماندنەوە ≡ خم کردن

**فشت / fişt/:** دەنـگ. پـش؛ فـس؛ دەنگـێ بـۆ دەرکردنی پشـیلە و ... ≡ پیشـت؛ صـدای رانـدن گربه و مانند آن

◘ **فشت لێ کردن:** پش/ فس لێ کـردن؛ دەنگـدان بۆ دەرکردن ‹لێم مۆڕ بوونەوە فشتێکم لێ کردن، زیڕاندیان «هـەژار، چێشـتی مجێـور»› ≡ پیشـت کردن

**فشـــتخاندن / fist(i)xandin/:** چـــــاوگ. هەڵخلیسکاندن ≡ لغزاندن

**فشتخین / fist(i)xîn/:** چـاوگ. هەڵخلیسـکان ≡ لغزیدن

**فشفشه / fişf(i)şe/:** نـاو. ١. فیشەکەشێتە؛ باڕووتی

لە قاقەز پێچراو، لە جێژناندا بۆ گەمە دەیتەقێنن ٢. پزدان؛ تیزانگ ٣. کوند؛ بوو؛ بایەقوش 🇮🇷 ١. فشفشه ٢. بادکنک ٣. جغد

**فشقاندن** / fişqandin/: چاوگ. دەنگی کەڵ و گامێش و بەراز دەرهێنان 🇮🇷 صدای گاومیش و گُراز درآوردن

**فشقەفشق** / fişqefişq/: دەنگەناو. دەنگی هەناسەی بە تەوژم لە لووتەوە ‹رای کرده پشت داران و ئیتر بە فشقەفشق ڕۆیشت «هەژار، چێشتی مجێور»› 🇮🇷 خش‌خش نفس زدن از بینی

**فشقیات** / fişq(i)yat/: ناو. /پلار/ ١. کاری ئاخافتنی بێ‌تام ٢. گاڵتە؛ حەنەک 🇮🇷 ١. یاوه ٢. شوخی

**فشک** / fişk/: ناو. ١. سپڵ؛ تاڵ ٢. پژمە؛ پشمە 🇮🇷 ١. سپرز؛ طحال ٢. عطسه

**فشکین** / fişkîn/: چاوگ. ١. پنژین؛ پژمین؛ پشمین ٢. فیشقاندنی بزنەکێوی لە کاتی ترسان و ڕا کردندا 🇮🇷 ١. عطسه کردن ٢. صدا درآوردن بز کوهی هنگام ترس

**فشنای** / fişnay/: چاوگ. ڕسکاندن؛ دەرچوون 🇮🇷 دررفتن

**فشنە** / fişne/: ناو. هەڵووژەڕەشە؛ ئاڵوو بوخارا 🇮🇷 آلوبخارا

**فش‌وفۆڵ** / fiş û foł/: ئاوەڵناو. زیاد لە پێویست گوشاد ‹لە جێژنەدا کلاوی لەنگەری لە سەر، جبەی قۆڵ فش‌وفۆڵ دەبەر، ئەدای ڕۆژاوا دەردێنن، ئورووپاییانە دەنوێنن! «هەژار، چوار نامیلکە»› 🇮🇷 زیادی گشاد

**فشۆڵ** / f(i)şoł/: ئاوەڵناو. سست و شل 🇮🇷 شُل و سست

**فشە**[1] / f(i)şe/: ناو. ١. حەنەک؛ گاڵتە ‹بە ڕاستم نەبوو، هەر بۆ فشە بوو› ٢. کاری خۆ هەڵکێشان ‹هیچی نییە، هەمووی فشەیە› ٣. چوڕە؛ مەلێکی چکۆلەی بۆرەلووکەیە ٤. سواڵەشێوێنکە؛ گیایەکە لە نێو گەنمدا شین دەبێ و کاتی دروێنە ناهێڵێ سواڵەکە پێکەوە بنووسێ و بڵاوی دەکاتەوە 🇮🇷 ١. شوخی ٢. لاف ٣. پرنده‌ای است ۴. گیاهی است

⊡ **فشە کردن**: ١. حەنەک کردن ٢. خۆ هەڵکێشان 🇮🇷 ١. شوخی کردن ٢. لاف زدن

**فشە**[2]: دەنگەناو. فش؛ فشەفش؛ دەنگی با کە لە کەلێنەوە دێت 🇮🇷 صدای عبور باد از درز

**فشەباز** / f(i)şebaz/: ئاوەڵناو. قڕۆ؛ فڕکەر؛ درۆزن 🇮🇷 دروغگو

**فشەفش**[1] / f(i)şefiş/: ناو. کاری خۆ هەڵکێشان 🇮🇷 خودستایی

**فشەفش**[2]: دەنگەناو. فش؛ فشە؛ دەنگی با کە لە کەلێنەوە دێت 🇮🇷 صدای عبور باد از درز

**فشەک** / f(i)şek/: ☜ **فیشەک**

**فشەککێش** / f(i)şekkêş/: ☜ **فیشەککێش**

**فشەکڵاونە** / f(i)şek(i)ławne/: ناو. چوڕەپۆپنە؛ چوڕەپۆپنەکی 🇮🇷 چکاوک کاکلی

**فشەکەر** / f(i)şeker/: ئاوەڵناو. خۆهەڵکێش 🇮🇷 لافزن

**فشەگاڵتە** / f(i)şegałte/: ناو. قسەی بە قەستی بۆ پێکەنین 🇮🇷 لطیفه؛ جوک

**فشەڵ** / f(i)şeł/: ئاوەڵناو. سنست و بێ‌ناو ‹سیستەمی فشەڵ؛ زەوی فشەڵ› 🇮🇷 پوک

⊡ **فشەڵ بوونی ئێسکە** سست و بێ‌بەرگە بوونەوەی ئێسکی لەش 🇮🇷 پوک شدن استخوان

**فشەڵ هێنان**: /مەجاز/ لاواز بوونی هێز و دەسەڵاتێک 🇮🇷 ناتوان شدن

**فشەڵۆک** / f(i)şełok/: ☜ **فشەڵە**

**فشەڵە** / f(i)şełe/: ئاوەڵناو. فشەڵۆک؛ سست و شل و خۆ نەگرتوو ‹دوو ساڵ و چەندێک لە سەر تەختێک ڕاکشێ، بیست‌وحەوت کیلۆ گۆشتی سست و فشەڵەت لێ زیاد بێ، چۆن دەتوانی کار بکەی؟ «هەژار، چێشتی مجێور»› 🇮🇷 شُل و وِل

**فشەڵی** / f(i)şełî/: ناو. سستی و بێ‌ناوی 🇮🇷 پوکی

**فشیای / fişyay/**: چاوگ. ڕسکان؛ بەر بوونی خوێنی لووت ⯀ خون‌دماغ شدن

**فشین / f(i)şîn/**: ☜ **فیشین**

**فک / fik/**: ناو. فکە؛ گریانی بێ‌دەنگ ⯀ مویە

⊡ **فک کردن**: ١. کردنــەوەی پێچــراوی زامــدار یــا لەجێ چووگ ٢. زانینی پرسـی دژوار ٣. لەبـەر خۆوە بێ‌دەنگ گریان ⯀ ١. باز کردن باندپیچی ٢. پاسخ دادن سؤال مشکل ٣. مویە کردن

**فکار / f(i)kar/**: ناو. ترس و نیگەرانی ⯀ دلواپسی

**فکر / fik(i)r/**: نـاو. ١. بـیر؛ هـزر؛ چـالاکی ئاگەدارانەی زەین ‹فکـر کردنـەوە› ٢. بـڕوا؛ بـاوەڕ؛ بۆچوون ‹فکری ئازادیخوازی› ٣. ڕەت؛ نەخشـە یـا بەرنامە بۆ کار یان ئامانجێکی تایبەت ‹ماڵ‌کردنـەوە فکرێکی باش بوو› ٤. خـەیاڵ؛ یـاد ‹فکـری دواڕۆژی ناکاتەوە› ٥. چار؛ چارە؛ ڕێچار ‹فکرت بۆ ئەم هـەموو قەرزە چییە؟› ⯀ ١تا٤. فکر ٥. راە حل

⊡ **فکر کردن**: ١. چـارە دۆزینـەوە ‹ڕۆژێ دانیشـین فکرێ بکەین بۆ گرفتەکانمان› ٢. *[مەجاز]* هەڕەشە کردن بۆ لێدان و تەمێ کردن ‹هـەی بێ‌حـەیا! فکرت ئەکەم!› ⯀ ١. فکر کردن ٢. تهدید کردن بـە تنبیە

**فکر کردنەوە**: تێ‌ڕامان؛ بیر کردنەوە ⯀ اندیشـیدن؛ فکر کردن

**فکریایەنە / fikrıyayene/**: چـاوگ. تـێ‌فکـرین ⯀ اندیشیدن

**فکرین / fikrîn/**: چـاوگ. بیر کردنەوە (زۆرتر لەگـەڵ «تێ»دا دەگوترێ) ⯀ فکر کردن

**فکلە / fikle/**: نـاو. فەکلە: ١. توێڵ؛ ئەنی ٢. مـووی سەر ئەنی ٣. قووڵایی پشـت مـل ⯀ ١. پیشـانی ٢. موی بر پیشانی ٣. گودی پشت گردن

**فکە / f(i)ke/**: ☜ **فك**

**فکین / f(i)kîn/**: چاوگ. بە بێدەنگ گریان ⯀ مویـە کردن

**فل / fil/**: ناوەڵناو. ١. *[پلار]* تەمـەڵ؛ لـەش‌گـران ٢. فلْ؛ بڵ ٣. شەکەت؛ زۆر ماندوو ٤. وێـک‌هـاتوو ⯀ ١. تنبل ٢. نـرم شـدەی میـوەی جـالیزی ٣. خسـتە و کوفتە ٤. بە هم آمدە

⊡ **فل بوون**: شەکەت بوون ⯀ از خستگی درماندن

**فل بوونەوە**: بڵ‌بوونەوە؛ شل و دەڵەمە بوونی میوە ⯀ شُل شدن میوە

**فلاسک / f(i)lask/**: نـاو. فەلاسـک؛ سـاردوگەرم؛ دەفرێکی دووپۆشە بۆ ڕاگرتنی سەرما یـا گـەرمای ناوەکەی ‹فلاسکی چای› ⯀ فلاسک

**فلافل / f(i)lfil/**: ☜ **فەلافل**

**فلان / f(i)lan/**: ☜ **فلان**

**فلت / filt/**: ناوەڵناو. ماندوو؛ مانگ؛ شەکەت ⯀ خستە

**فلتان / fiḽtan/**: چاوگ. فل بوون؛ شەکەت بـوون ⯀ خستە شدن

**فلتوخ / filtox/**: ناوەڵناو. لە بـەر یـەک هەڵوەشـاو و پلیخاو ⯀ متلاشی و لە شدە

**فلتیرەم / filtîrem/**: نـاو. یەکەیـەکی کێشـان لـە زەمانی عوسمانیدا ⯀ واحد وزنی در دوران عثمانی

**فلتین / filtîn/**: چاوگ. ڕزگار بوون لە بەلا ⯀ نجـات یافتن

**فلچ / filç/**: ناوەڵناو. پلچ؛ تلیخاو؛ پلیخاو ⯀ لِە

**فلس / fils/**: ناو. فلووس؛ پچـووکترین پـارەی وڵاتی عارەبان ⯀ از اجزاء پول کشورهای عربی

**فلفل / filfil/**: نـاو. ١. ئیسـۆت؛ بیبـار ٢. عەنتـەر؛ جۆرێ مەیموون ⯀ ١. فلفل ٢. انتر

**فلفەلەک / filfelek/**: ناو. مەرزە؛ مەرسە؛ مـەرزەک؛ گیایەکی گەڵاوردی تێژی بۆنخۆشە وشک دەکرێ و دەخورێ ⯀ مرزە

**فلوئور / f(i)lu'ûr/**: نـاو. توخمی کیمیایی ناکانزا بـە ژمارەی ئـەتومی ٩ و کیشـی ئـەتومی ١٨,٩٩ لـە دەستەی هالۆژینەکان کە لە بـارودۆخی ئاسـاییدا بـە ڕەنگـی سـەوزی کاڵـە و لـە ئـاو و ئەلکولـدا

دەتوێتەوە و بۆ بەرهەم هێنانی پلاستیکی باش لە دەزگاگەلی سەرماوەز و هەویری ددانشـۆری دژی کرمۆلی بە کار دێت ⇐ فلوئور

**فلۆرسانس** / f(i)lorsans/: ناو. شـتانێ کـە پـاش تیشک لێ دان تیشک بدەنەوە ⇐ فلورسانس

**فلۆرێسێنت** / f(i)lorêsênt/: ئاوەڵناو. تیشـک‌دەرەوە؛ بە تایبەتمەندی فلورسانسەوە ⇐ فلورسنت

**فلوت** / f(i)lût/: ناو. سازێکی باژەنی لوولـەیی، پتـر چێوی یان پلاستیکی و بێ زمانـە، کـە هەناسـەی ژەنیار لە کونـەکانی سـەریەوە دەچێتـە نـاو و بـە قامک دانان لە سەر کونەکانی لای خـواروو، نـوتی مووسیقای پێ دەژەنرێ ⇐ فلوت

**فلوس** / f(i)lûs/: ناو. ۱. ☜ **فلس** ۲. دراو؛ پارە ⇐ ۱. ☜ **فلس** ۲. پول

**فلوف** / f(i)lûf/: ناو. خولیا؛ ئارزووی کاتی و زووڕابـر ⇐ هوس آنی

**فلوفا** / f(i)lûfa/: ناو. فلووفاو؛ خولیای کار و بـیرێ ⇐ کرمِ کار

**فلووفاو** / f(i)lûfaw/: ☜ **فلوفا**

**فلە** / f(i)le/: ☜ **فەلە[1]ـ۱**

**فلیتە[1]** / f(i)lîte/: ناو. پلیتەچرا ⇐ فتیلەی چراغ

**فلیتە[2]**: ئاوەڵناو. داوێن‌تەڕ؛ داوێن‌پیس؛ شواڵ‌چەپـەڵ ⇐ تردامن

**فلیقاتە** / f(i)lîqate/: ↓

⊡ **فلیقاتـە چـوون**: بڵ بـوون؛ گەیشـتنی زۆر و شـل بوونی میوە ‹قەیسـییەکە فلیقاتـەی چـووە، ئێسـتا نەیخۆین، ناکەوێتە بەیانی› ⇐ زیاد رسیدن میوە

**فلیقـان** / f(i)lîqan/: چـاوگ. تێنەپـەڕ. //فلیقـای دەفلیقێ؛ بفلیقێ// فلیقانەوە؛ فلێقان؛ فلێقیان ⇐ له شدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: فلیقـاو/ چـاوگی نـەرێنی: نەفلیقان

**فلیقاندن** / f(i)lîqandin/: چاوگ. تێپەڕ. //فلیقانـدت؛ دەفلیقـێنی؛ بفلیقێنـە// فلیقاندنـەوە؛ فلیقـانن؛ فلیقاننـەوە؛ فلـێقاندن؛ فلـێقانن؛ فلـێقاننەوە؛ پلیشاندنەوە ⇐ له کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەفلیقاندن

**فلیقاندنەوە** / f(i)lîqand(i)newe/: ☜ **فلیقاندن**

**فلیقانن** / f(i)lîqanin/: ☜ **فلیقاندن**

**فلیقاننەوە** / f(i)lîqannewe/: ☜ **فلیقاندن**

**فلیقانە** / f(i)lîqane/: ناو. حاچـە؛ پـەل ⇐ شـاخە؛ انشعاب

**فلیقانەوە** / f(i)lîqanewe/: ☜ **فلیقان**

**فلیقاو** / f(i)lîqaw/: ئاوەڵناو. فلیقاوە؛ فلێق؛ فلێقیاگ ⇐ له شده

**فلیقاوە** / f(i)lîqawe/: ☜ **فلیقاو**

**فلیم** / filîm/: ☜ **فیلم**

**فلین** / f(i)lîn/: چـاوگ. هەڵقرچان؛ چـرچ بـوون ⇐ چروک شدن

**فلێقاندنـــەوە** / f(i)lêqand(i)newe/: چـــاوگ. تلیقاندنەوە؛ پان و فلچ کردنەوە ⇐ له کردن

**فلێقانـەوە** / f(i)lêqanewe/: چـاوگ. تلێقانـــەوە؛ تلێقیانەوە؛ تووچان ⇐ لِه شدن

**فلێقنای** / f(i)lêqnay/: چاوگ. فلیقاندن ⇐ له کردن

**فلێقیای** / f(i)lêqyay/: چاوگ. فلیقان ⇐ له شدن

**فڵ** / fił/: ☜ **فل ـ۲**

**فڵان** / f(i)łan/: جێناو. فـالان؛ فـران؛ فـلان؛ ئـەوەی ناوی نابەن ⇐ فُلان

**فڵانبێمان** / f(i)łanbêman/: جێناو. ۱. ئـەم و ئـەوی نادیار ۲. وشەیەکە وەک: وانێک؛ هین ⇐ ۱. فـلان و بهمان ۲. چیز؛ از تکیه‌کلام‌ها

**فڵانفڵان** / f(i)łanf(i)łan/: ناو. جوێنێکە ⇐ دشـنامی است

**فڵانکەس** / f(i)łankes/: ☜ **فلانەکەس**

**فڵانوفیسار** / f(i)łan û fisar/: جێناو. فـران‌وفیسـتار؛ فلان‌وفیستار؛ ئەم و ئەوی نادیار ⇐ فلان بیستار

**فڵان‌وفیستار** / f(i)łan û fîstar/: ☜ **فڵان‌وفیسار**

**فڵانه‌کەس** / f(i)łanekes/: جێناو. فرانکەس؛ فرانەکەس؛ فڵان‌کەس؛ فڵانی؛ فیسارەکەس؛ فرانی؛ کەسێ کە ناوی نابەن ≡ فلانی

**فڵانی** / f(i)łanî/: ☜ **فڵانه‌کەس**

**فڵت**[1] / fiłt/: ☜ **فڵته**[1]

**فڵت**[2]: ئاوەڵناو. گوشاد؛ هەراو؛ فرت ≡ گشاد

**فڵت**[3]: دەنگ. /پلار/ فەرمان بە بێدەنگ بوون ‹ئا تۆ خوا فڵت! مێشکم تەقی› ≡ امر به سکوت

**فڵتاندن** / fiłtandin/: چاوگ. تێپەڕ. //فڵتاندت؛ دەفڵتێنی؛ بفڵتێنە// /پلار/ قسەی بێ‌تام و نابەجێ کردن ≡ یاوه گفتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەفڵتاندن

**فڵتنای** / fiłtnay/: چاوگ. /پلار/ فڵتاندن ≡ یاوه گفتن

**فڵته**[1] / fiłte/: ناو. فڵت؛ قسەی بێ‌تام و نابەجێ ≡ یاوه

**فڵته**[2]: دەنگەناو. دەنگی قسە کردنی مرۆی بێ‌ددان ‹هەر فڵتەی دێ و کەس لە قسەی ناگا!› ≡ صدای حرف زدن آدم بی‌دندان

**فڵته‌دەمە** / fiłtedeme/: ئاوەڵناو. /پلار/ دەم گوشاد و قسەنەزان ≡ دهان گشاد یاوه‌گو

**فڵته‌فڵت**[1] / fiłtefiłt/: ناو. /پلار/ ١. فڵتە؛ قسەی بێ‌تام و نابەجێ ٢. قسەی گران کە تێ‌گەیشتنی دژوارە ✱ هەروەها: **فڵته‌فڵت کردن** ≡ ١. یاوه ٢. فلسفه‌بافی

**فڵته‌فڵت**[2]: دەنگەناو. /پلار/ فەرمانی بێدەنگ بوون ‹دا فڵتەفڵت! بزانین چی ئێژن› ≡ امر به سکوت

**فڵته‌قان** / fiłteqan/: ☜ **پرته‌قاڵ**

**فڵچ**[1] / fiłç/: ناو. لێو؛ دەرەوەی زار ‹دەم و فڵچ› ≡ لب و لوچه

**فڵچ**[2]: ئاوەڵناو. ١. پلیخاو؛ تلێقیاگ ٢. فەلج؛ کەپۆپان؛ لووت‌پان ≡ ١. لهیده ٢. پهن‌بینی

**فڵچ**[3]: دەنگ. ١. دەنگی دەم لە کاتی خواردندا ٢. دەنگی پێ لە سەر قوڕ و تەڕایی ≡ ١. صدای جویدن ٢. صدای پا روی گل و جای خیس

**فڵچنای** / fiłçnay/: چاوگ. فڵچوهۆڕ کردن ≡ ملچ ـ ملوچ کردن

**فڵچوهوڕ** / fiłç û huř/: ☜ **فڵچوهۆڕ**

**فڵچوهۆڕ** / fiłç û hoř/: دەنگەناو. فڵچووهوڕ؛ فڵچەفڵچ؛ فرچافرچ؛ فڵچەی فریە: ١. دەنگی دەم لە کاتی ماچ کردندا ‹بوو بە فڵچوهۆڕی ماچان. خانمی سەفیر لە شام ئوستادی حقووق بووە و سینەم لای ئەو دەرسی خوێندووە «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. دەنگی پێ لە سەر قوڕ و تەڕایی ≡ ١. صدای ماچ و بووسه ٢. صدای پیاپی پا روی گل و جای خیس

**فڵچه**[1] / fiłçe/: ناو. فرچە؛ بەتارە؛ گزکچە؛ کەرەستەیەک بە چەپکێ ڕیشوو و دەسکێکی بچووک بۆ پێدا ساوین ≡ فرچه

**فڵچه**[2]: دەنگ. دەنگی پێ لە سەر قوڕ و تەڕایی ≡ صدای پا روی گل و جای خیس

**فڵچه‌فڵچ** / fiłçefiłç/: ☜ **فڵچوهۆڕ**

**فڵق**[1] / fiłq/: ناو. پارەیەک بووە لە ڕۆژگاری بابانەکاندا ≡ واحد پولی در دوران امارت بابان

**فڵق**[2]: ئاوەڵناو. ١. شل و نەرم لە دەستدا ٢. گوشاد؛ فرت (کونی چەرم) ≡ ١. سُست و شُل ٢. فراخ (سوراخ چرم)

**فڵق**[3]: دەنگ. دەنگی شتی تراو لە ناو بۆشاییدا کە دەبزوێ ≡ صدای به هم خوردن مایع

**فڵقن**[1] / fiłqin/: ناو. /پلار/ فڵقنە؛ فڵقێ؛ جوێنی ژنانە ≡ دُشنام زنانه

**فڵقن**[2]: ئاوەڵناو. /پلار/ فڵقنە؛ مێوینەیێ کە دەنگ لە خەمشەیەوە بێت ≡ مادینه‌ای که فرجش صدا کند

**فڵقنه** / fiłq(i)ne/: ☜ **فڵقن**

**فڵقوهۆڕ** / fiłq û hoř/: ☜ **فڵقه‌فڵق**

**فڵقه** / fiłqe/: دەنگ. دەنگی لێک کەوتنی شتانی

نەرم و تەڕ (وەک: زمان و زار) ‹بۆخۆی لە فلقەی پێکەنینی دا «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ صدای بە هم خوردن اجسام نرم و خیس

**فلقەفلق** / fiłqefiłq/: دەنگەناو. فلق‌وهۆڕ؛ فلقەی زۆر ☰ صدای پیاپی بە هم خوردن مایع

**فلقێ** / fiłqê/: ☜ **فلقن**[1]

**فله** / f(i)łe/: ☜ **فەلە**[1]ـ١

**فلەه** / f(i)łeh/: ☜ **فەلە**[1]ـ١

**فلەهن** / f(i)łehin/: ناو. جۆرێ ماسی ☰ نوعی ماهی

**فلیقاندنەوە** / f(i)łîqand(i)newe/: چاوگ. داشلیقاندن؛ پلیخاندن ☰ لە کردن

**فلیقانەوە** / f(i)łîqanewe/: چاوگ. داشلیقان؛ پلیخانەوە ☰ لە شدن

**فلیقاوە** / f(i)łîqawe/: ناوەلناو. داشلیقاو؛ پلیخاو ☰ لەشدە

**فلێق** / f(i)łêq/: ☜ **فلیقاو**

**فلێقان** / f(i)łêqan/: ☜ **فلیقان**

**فلێقاندن** / f(i)łêqandin/: ☜ **فلیقاندن**

**فلێقانن** / f(i)łêqanin/: ☜ **فلیقاندن**

**فلێقاننەوە** / f(i)łêqannewe/: ☜ **فلیقاندن**

**فلێقیاگ** / f(i)łêqyag/: ☜ **فلیقاو**

**فلێقیان** / f(i)łêqyan/: ☜ **فلیقان**

**فم** / fim/: ☜ **فنگ**

**فمەفم** / f(i)mefim/: ناو. چلمەچلم؛ لووشکەلووشک؛ دۆخی لەسەریەک هەلکێشانی چلم ☰ حالت بالا کشیدن پی‌درپی دماغ

**فن** / fin/: ☜ **فنگ**

**فنار** / f(i)nar/: ناو. کاری هەلاتن؛ ڕاکردن لە ترسان ☰ فرار

**فناز** / f(i)naz/: ناو. فناس؛ کاری ناڕەوا و مایەی شەرمەساری ☰ تبهکاری

**فناس** / f(i)nas/: ☜ **فناز**

**فنج**[1] / finc/: ☜ **فنج**

**فنج**[2]: دەنگ. دەنگی بێقل کاتی قسە کردن ☰ صدای بینی هنگام حرف زدن

**فنجان** / fincan/: ناو. کووپ؛ پیالە؛ دەفری بچووکی دەم‌هەراوی دەسکدار بۆ خواردنەوەی شتی گەرم ☰ فنجان

**فنجانێن** / fincanên/: ناو. بازییەکە بە فنجان دەکرێ ☰ نوعی بازی با فنجان

**فنجک** / fincik/: ناو. کاری باز دان؛ خۆ هەلدان ☰ پرش

**فنجڵ** / fincił/: ناو. بۆرەپیاو؛ گولەکە ‹ئێوارە وەختە فنجل بە بەختە «فولکلۆر»› ☰ آدم بی‌ارزش

**فنجەفنج** / fincefinc/: دەنگەناو. منجەمنج؛ منگەمنگ ‹ئەم فنجەفنجەت لە چییە؟› ☰ مِن‌ومِن

**فنچق** / finçiq/: ناو. فنج؛ سەیرە ☰ فنچ

**فنچقە** / finçqe/: ناو. پشکۆژی نەپشکوتووی دار ☰ شکوفەی باز نشدەی درخت

**فنچک** / finçik/: ناو. ١. کوت؛ حینچکە ٢. فرچک؛ کاری تێ‌هەلکەوتنی بێچوو لە گوانی دایک بۆ مژین ☰ ١. کلە هنگام جماع ٢. کلە زدن بە پستان مادر

**فند** / find/: ناو. ١. شەم؛ مۆمی هەلکردن ٢. فەن؛ حیلە و حەوالە ‹فند و فێل› ٣. شەمچە؛ شخاتە؛ شخاوتە؛ شقارتە ☰ ١. شمع افروختنی ٢. نیرنگ ٣. کبریت

**فنداک** / findak/: ناو. فندانک؛ مۆمدان؛ جێگەی شەم ☰ شمعدان

**فندانک** / findanik/: ☜ **فنداک**

**فندق** / findiq/: ناو. فنق؛ فنەق؛ فنۆق؛ فنقی؛ کەلووز: ١. دارۆچکەیەکی گەلا گنجری کولکنە بە گولی پەلداری سوور و سپی و میوەی خڕەوە ٢. میوەی ئەو دارە کە خڕ و گچکەیە و توێکلی قاوەیی و ڕەقە و کاکلەکەی تەژی لە ڕۆنە و وەکوو چەرەز دەخورێ ☰ ١و٢. فندُق

**فندک / findik/**: ناو. ١. شەم ٢. شەمچە ☰ ١. شمع ٢. کبریت

**فندلی / find(i)lî/**: ناو. چکۆلەی نازدار ☰ کوچولوی ناز

**فندگوله / findegule/**: ☜ **فیسقه ـ١**

**فنق / finq/**: ناو. ١. ☜ **فندق** ٢. پل؛ چەقەنە ☰ ١. ☜ **فندق** ٢. بشکن

▣ **فنق شکانن**: چەقەنـە لـێ دان؛ پـل تەقانـدن ☰ بشکن زدن

**فنقی / finqî/**: ☜ **فندق**

**فنک / fink/**: ناو. جاش‌ئێستر ☰ کُرّەقاطر

**فنکەفنک / finkefink/**: ☜ **فنگەفنگ**

**فنگ / fing/**: دەنگ. فم؛ فن؛ مـف؛ مـش؛ فیشـکە؛ لووش؛ شم؛ لم؛ خم؛ هنگ؛ دەنگی لووت لە کـاتی سڕیندا ☰ فین

**فنگە / finge/**: دەنگەناو. فنج؛ دەنگی بێڤل ☰ صدای بینی

**فنگەفنگ / fingefing/**: دەنگەناو. فنکەفنک؛ فنەفن: ١. فنج؛ دەنگی لووت ٢. گریانـێ کـە بـە نـووزە و منگە بێ ☰ ١. صدای بینی ٢. گریەی آرام

**فنۆق / f(i)noq/**: ☜ **فندق**

**فنەفن / f(i)nefin/**: دەنگەناو. ١. ☜ **فنگـەفنـگ** ٢. بۆڵە و پرتەی لە ژێر لێوانەوە ٣. فتـە ـ فتـە؛ بـۆن کردنی سـەگ ☰ ١. ☜ **فنگـەفنـگ** ٢. غرولنـد ٣. زمین بو کردن سگ

**فنەق / f(i)neq/**: ☜ **فندق**

**فـوارە / f(i)ware/**: نـاو. کوفـارە؛ کفـارە؛ فیچقـە؛ فیشـکە؛ فیجقـە؛ کولکولـە؛ فـوویرەک؛ پیـت؛ ئاڤچزک؛ کەرستەیێ کە ئـاو و مـاکی تـراو بـەرەو سەر دەپژێنێ ☰ فوّارە

**فوتوسەنتز / futosentiz/**: ناو. ڕەوتـێ کـە گیـا ـ وێڕای تیشکی هەتاو ـ لـە کـەربون و هەڵـمی ئـاو، هیدراتی کەربون چێ دەکا ☰ فتوسنتز

**فوتۆکـوپی / futokupî/**: نـاو. فتۆکـۆپی؛ کـوپی: ١. کاری وێنە هەڵگرتن لـە بەڵـگەیەک بـە دەزگـای تایبـەت بـەو کـارە ٢. دەزگایـێ کـە بـە هـۆی کاردانەوەی کیمیایی (فوتۆکوپی تەڕ) یـان فیزیکـی (فوتۆکوپی وشک، زیراکس) بە هـۆی تیشـکەوە، لـە بەڵگە وێنە هەڵدەگرێ ٣. وێنەیێ کە بە دەزگـای فوتۆکوپی گیرابێ ☰ ١تا٣. فتوکپی

**فوتو / futû/**: ناو. نەزر و نیاز ☰ نذر

**فورم / furm/**: ☜ **فۆرم**

**فورمـول / furmûl/**: نـاو. فورمـوول: ١. *[ریـازی]* بنـەمایێ کـە پتـر بـە نیشـانەگەلی بیرکـاری دەردەبـڕدرێ ‹فورموولـی دووڕسـتەیی› ٢. *[کیمیا]* شاندانی پێکهاتەیەکی شیمیایی بە شێوەی نیشانە ‹فورموولـی سوولفوریک ئەسید› ٣. ڕێچارە؛ شێوەی چارەسەری گرفت و پرسێک ‹هێشتا فورموولێکمان بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ئەم کارە نییە› ☰ ١تا٣. فُرموول

**فورموڵ / furmûł/**: ☜ **فورمول**

**فوسفوڕ / fusfuř/**: ناو. توخمـی کیمیـایی ناکـانزا بـە ژمارەی ئەتۆمی ١٥ و کێشی ئـەتومی ٣٠,٩٧، کـە لە بەرهەم هێنانی ئالیاژ و شەمچە و کووتدا بـەکار دێت. بێجگە فوسفوری ئاسایی، فوسفوری سـپی و سوور و زەرد و بنەوشیش هەیە ☰ فسفر

**فولکلـۆر / fulk(i)lor/**: نـاو. فەرهــەنگی خەڵــک؛ کەلەپووری فەرهەنگی نەتەوەیەک ☰ فلکلور

**فولکلـۆری / fulk(i)lorî/**: ئاوەڵناو. سەر بە فەرهـەنگی خەڵک ☰ فلکلوری

**فولکە / fulke/**: ☜ **فەلەکە ـ١**

**فونـەتیک / funetîk/**: نـاو. *[زمانناسـی]* دەنـگناسـی؛ زانستی ناسین و لێکدانەوەی دەنگگەلی تایبەت بە زمان یا دەستەزمانێک ☰ آواشناسی

**فونیم / funîm/**: ناو. *[زمانناسی]* واچ؛ فـۆنیم؛ هـەرکام لـە ئەنـدامانی چکۆلـەترین یەکـەی ئاخـاوتن کـە جیاکەرەوەی مـورفیم یـان وشـەیەکن لـە یـەکتر

«گول» و «گول» هەر یەکە لە سێ فونیم پێکهاتوون›
🇮🇷 واج

**فۆتک** / fotik/: ناو. فۆتە؛ پارچەی ڕەشی سەری ژنان 🇮🇷 سرپیچ مشکی زنانه

**فۆتە** / fote/: ناو. ١. بەرەڵبێنەی حەمام ٢. ☜ **فۆتك** 🇮🇷 ١. لُنگ ٢. ☜ **فۆتك**

**فۆرت** / fort/: ناو. کاری خۆهەڵدانی بە درۆ 🇮🇷 لاف و گزاف

**فۆرتان** / fortan/: چاوگ. خۆهەڵکێشان 🇮🇷 لاف زدن

**فۆرتوت** / fortût/: ☜ **فەرتوت**

**فۆرتەک** / fortek/: ناوەڵناو. خۆهەڵکێش 🇮🇷 خودستا

**فۆرم** / form/: ناو. فرم؛ فورم: ١. بیچم؛ نـژم؛ شـێوە یـان حاڵـەتی شـتێ ‹فـۆرمی قـژی گۆڕابـوو› ٢. یونیفۆرم؛ جلکی فەرمی یەکدەست ٣. بەرژەنامە؛ پرسیارنامە؛ پەڕەیێکی چاپی بۆ نووسـینی زانیـاری داواکـراو لەمـەڕ کـەس یـان شـتێکەوە ٤. چەنـد (١٦یـان ٨) لاپەڕەی کتێب کە پێکەوە چاپ دەبـن 🇮🇷 ١تا٤. فُرم

⊡ **فۆرم پێ دان**: شـێوە پـێ دان؛ بـە شـێوە یـان حاڵەتێکی تایبەت دەرهێنان 🇮🇷 فُرم دادن

**فۆرمالیتە** / formalîte/: نـاو. ١. ڕواڵـەتی؛ هـەر شـتێکی بـێ‌نـاوەڕۆک ٢. /مەجاز/ ڕواڵـەتکاری؛ ڕواڵەتسازی 🇮🇷 ١و٢. فُرمالیته

**فۆقل** / foqil/: ناوەڵـناو. تـەرپۆش؛ جـل و بـەرگ ڕێکوپێک 🇮🇷 شیک و مُرتب

**فۆک** / fok/: ناو. گیانەوەرێکی گوانداری ئاوژییـە بـە لەشی گەورەی نەرم و گۆشتن، دەست و پێ وەک باڵی ماسی و مووی زبر و کورتەوە 🇮🇷 فُک

**فۆکلە** / fokle/: ناو. کاکۆڵ؛ کوودیلە؛ قژی فـڕدراوی پێشەوەی سەر 🇮🇷 فُکُل

**فۆل** / fol/: پێرۆ. ← **فەرەوفۆڵ**

**فۆڵ** / foł/: پێرۆ. ← **فشوفۆڵ**

**فۆڵوفەرە** / foł û fere/: ☜ **فەرەوفۆڵ**

**فۆم** / fom/: نـاو. فووم؛ چەشنێک ماکی پلاسـتیکی سۆکی وەک هەوری پفکـراو کـە لـە پیشەسـازیدا کەڵکی لێ وەردەگرن 🇮🇷 فوم

**فۆنیم** / fonîm/: ☜ **فونیم**

**فۆنێتیک** / fonêtîk/: ناو. کاری نووسـینی دەنگـەکانی زمانێک بە نیشانەگەلی تایبەت 🇮🇷 آوانگاری

**فوو** / fû/: دەنگەناو. پف؛ کاری بە کونی نێـوان لێـودا با لە دەم وەدەرنان ‹فـوو لـە ئـاگر کـەیت سمێڵـت ئەسووتێ «مەسەل»› 🇮🇷 پُف؛ فوت

⊡ **فوو تێ کردن**: ١. پف دان؛ با تێ کردن ٢. /مەجاز/ هەڵخڕاندن و بە قسە فریودان 🇮🇷 ١. باد کـردن ٢. هندوانه زیر بغل گذاشتن

**فوو دان**: ١. پف دان؛ بە فوو پەنەماندن ٢. /مەجاز/ بەزاندن لە شەڕی منالانـەدا 🇮🇷 ١. بـاد کـردن ٢. شکست دادن در دعوای کودکانه

**فوو کردن**: ١. پف لە شتێ کردن ٢. پف تێکـردن ٣. /مەجاز/ پێ‌هەڵگوتنی بە درۆ 🇮🇷 ١. فوت کردن ٢. نفس دمیدن ٣. چاپلوسی کردن

**فوو لە دۆ نەکردن**: /کینایە/ لێ نەوەستان؛ بە بێ بیر لێ کردنەوە دەست بـۆ بـردن 🇮🇷 بـدون بررسـی کاری کردن

**فوو لێکردن**: پف لێ‌کردن 🇮🇷 فوت کردن

**فـووت** / fût/: نـاو. فـووت؛ پـا؛ یەکـەی درێژایـی ئینگلیسـی و ئـەمریکی، بەرامبـەر بـە ٣٠,٤٨ سانتی‌میتر (١٢ ئینچ) 🇮🇷 فوت؛ واحد طول انگلیسی

**فووتباڵ** / fûtbał/: ناو. تۆپی‌پێ؛ گۆڵـێن؛ یارییـەکی مەیدانییە لە نێوان دوو تیمـدا، بـە تۆپێکـەوە، کـە هەرکام لە سەرێکی مەیدانەوە دەروازەیان هەیـە و مەبەسـتیان بـە پـێ خسـتنی تۆپەکەیـە بـۆ نێـو دەروازەی بەرامبەریان 🇮🇷 فوتبال

**فووتباڵیست** / fûtbałîst/: نـاو. یـاریزانی فووتبـاڵ 🇮🇷 فوتبالیست

**فوتسال / fûtsał/**: ناو. یاری فووتبال لە شوێنی سەرگیراو، بە تۆپێکی گچکە لە مەیدانێکی بەرتەسکدا ☰ فوتسال

**فودان / fûdan/**: ناو. تیزانگ؛ میزەڵان ☰ بادکُنک

**فودراو / fûd(i)raw/**: ئاوەڵناو. پفدراو؛ پەنەماو بە پف ‹سەر و دۆشەگ و سەنیری فوودراوی لاستیک و دوو پەتوویان داینێ «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ آماسیده؛ بادکرده

**فودریاگ / fûdiryag/**: ئاوەڵناو. نەپەخەک؛ پەنەماو بە با ☰ بادکرده

**فودڵ / fûdił/**: ئاوەڵناو. دڵکێش؛ جوانکیلەی خونچیلانە ☰ کوچولوی زیبا

**فورهە / fûrhe/**: ناو. تافگەی پچووک ☰ آبشار کوچک

**فورین / fûrîn/**: دەنگەناو. دەنگی قوڵتەی ئاو ☰ صدای جوشیدن آب

**فوفل / fûfil/**: ناو. ۱. دارێکی جوانە بە ساقەتەی بڵیند و لقی کورت و گەڵای پانەوە، چێوەکەی بۆ نازککاری بە کار دێ ۲. تۆمی بەری داری فووفل کە درشت، هێلکەیی، خورمایی و لەخۆگری ئالکالۆئیدە ☰ ۱و۲. فوفل

**فوکراو / fûk(i)raw/**: ئاوەڵناو. نەفخی؛ زگ باکردوو ☰ بادکرده

**فوگرە / fûg(i)ře/**: ناو. فووی توند لە ئاگر ☰ فوت قوی بر آتش

**فوم / fûm/**: ☜ فۆم

**فون / fûn/**: ناو. گزی؛ گەڕ؛ فێڵ؛ حیلە ☰ حیلە؛ نیرنگ

**فونک / fûnik/**: ☜ فیتك

**فونکایی / fûnkayî/**: ☜ فیتکی

**فونکی / fun(i)kî/**: ☜ فیتکی

**فویر / fûyr/**: ناو. ۱. قوڵت؛ کوڵ ۲. ڕەوتی دەرچوونی ئاو بە نهێم ☰ ۱. غلیان ۲. فَوَران

**فویرەک / fûyrek/**: ☜ فوارە

**فویریان / fûyr(i)yan/**: چاوگ. ۱. فیچقە کردن ۲. هەڵاتنی هەویر ۳. زگ دان و هەڵتۆقینی وەک زەمینی شل و سست ٤. کوڵین لە سەر ئاگر ☰ ۱. فَوَران کردن ۲. برآمدن خمیر ۳. بر آمدن زمین سُست ۴. جوشیدن روی آتش

**فە / fe/**: ناو. ۱. ☜ فەت ـ۳ ۲. *[منداڵانە]* شیو بە زاراوەی منالاندا ☰ ۱. ☜ فەت ـ۳ ۲. آش

**فەت / fet/**: ناو. ۱. ساقی؛ لەش‌ساغی ۲. ☜ فەتق ۳. فە؛ تواشا؛ لێ ڕوانین ☰ ۱. تندرستی ۲. ☜ فەتق ۳. تماشا

**فەتا / feta/**: ناو. ۱. ئاهۆ؛ ئازار؛ پەتا؛ درم ۲. چاوقووڵکە؛ وەبا ☰ ۱. بیماری مُسری ۲. وبا

**فەتات / fetat/**: ئاوەڵناو. پاک و بێ‌خەوش ☰ خالص

**فەتاح / fetaĥ/**: ناو. جۆرێ هەڵپەڕکێ گورج و بە تەوژم ☰ نوعی رقص کُردی

**فەتاح پاشایی / fetaĥpaşayî/**: ناو. ۱. جۆرێ دیلان ۲. *[کینایە]* شلۆقی و هەرا و بەزم لە خۆشیاندا ☰ ۱. نوعی رقص کُردی ۲. جنجال و هیاهوی شادمانە

**فەتار / fetar/**: ناو. دڕاو؛ دادڕاو ☰ چاک؛ پارە

**فەتار ـ فەتار / fetar fetar/**: ئاوەڵناو. شڕ و دڕ؛ پارە ـ پارە ☰ چاک ـ چاک

⊡ **فەتار ـ فەتار بوون**: شڕ بریان؛ شڕ و دڕ بوون ☰ چاک ـ چاک شدن

**فەتارەت / fetaret/**: ناو. فەتەڕات؛ چۆرتم؛ بەڵا ☰ بلا

**فەتالی / fetalî/**: ناو. یەکەی پارەیێ لە سەردەمی فەتالیشادا ☰ واحد پول فتحعلی‌شاهی

**فەتان / fetan/**: چاوگ. ۱. ڕزین و هەڵا بوون ۲. ئاوا بوونەوەی زەمینی نەکێڵدراو ☰ ۱. فرسودن ۲. احیا شدن زمین بایر

**فەتاندن / fetandin/**: چاوگ. فەتهاندن: ۱. ئاوەدان کردنەوەی زەوینی بێ‌خاوەن و نەکێڵدراو ۲.

کۆڵین؛ ڤەکۆڵین ٣. تۆژینەوە؛ کۆڵینەوە ☰ ١. احیا کردن زمین بایر ٢. کندن ٣. پژوهش کردن

**فەتبەن / fetben/**: ناو. ١. باتووبەن؛ گونبەندی پیاوی قۆڕ ٢. جۆرێک پۆشەن بۆ بەرگری لە داهێزان و ژانی قۆڕی ☰ ١و٢. فتق‌بند

**فەتراک / fetrak/**: ئاوەڵناو. زیانۆک؛ ئازاردەر ☰ زیان‌رسان

**فەتسان / fetsan/**: چاوگ. خنکان؛ خنکیان ☰ خفه شدن

**فەتساندن / fetsandin/**: چاوگ. خنکاندن ☰ خفه کردن

**فەتسین / fetsîn/**: چاوگ. ١. خنکان؛ خنکیان ٢. قەڵەشین ☰ ١. خفه شدن ٢. ترک خوردن

**فەتق / fetq/**: ناو. قۆڕی؛ غۆڕی؛ کوویت؛ وەتەبا؛ فەت؛ فتق: ١. دۆخی خزانی نائاسایی ئەندامێک بۆ دەرەوەی شوێنی خۆی (وەک: فەتقی مێشک) ٢. گەدەوڵی؛ دۆخی دەرپەڕینی ئەندامێکی ناوسک لە دیوارەی ماسوولکەیی زگەوە (وەک: قۆڕی بەرگەدە) ٣. گون‌شۆڕی؛ گونەکی؛ داهێزاوی گونان ☰ ١تا٣. فتق

**فەتقۆ / fetqo/**: ناو. مرۆی قۆڕ ☰ بیمار فتقی

**فەتکار / fetkar/**: ئاوەڵناو. فاسد؛ گەندەڵ ☰ فاسد

**فەتلین / fetlîn/**: چاوگ. ١. وەرسووڕانەوە؛ گەڕانەوە؛ گەڕیانەوە ٢. ئاوڕ دانەوە؛ لا کردنەوە ٣. وەرپێچانەوە؛ پێچ خواردن ☰ ١. برگشتن ٢. واپس نگریستن ٣. پیچ خوردن

**فەتەتنای / fetetnay/**: چاوگ. داڕزاندن؛ داوەشاندن ☰ از هم گُسیختن

**فەتەتیای / fetetyay/**: چاوگ. داڕزان؛ داوەشان ☰ از هم گُسیختن

**فەتەڕات / feteȓat/**: ☜ **فەتارەت**

**فەتهاندن / fethandin/**: ☜ **فەتاندن**

**فەتهین / fethîn/**: ☜ **فەتین**

**فەتیر / fetîr/**: ناو. ١. هەویری بێ هەویرترش ‹بێ مایە فەتیرە «مەسەل»› ٢. نان لە هەویری هەڵنەهاتوو ☰ ١. خمیر بی‌مایە ٢. نان از خمیر برنیامده؛ فطیر

**فەتیرە / fetîre/**: ناو. ١. نانی فەتیر ٢. جێژنێکی جوولەکانە ☰ ١. نان از خمیر برنیامده؛ فطیر ٢. از اعیاد یهود

**فەتین / fetîn/**: چاوگ. فەتهین: ١. پیش هەڵاتن؛ پشوو نەهاتنەوە لە بەر گەرما ٢. تۆپین ☰ ١. نفس گرفتن از گرما ٢. مُردار شدن

**فەحس / feĥs/**: ناو. ١. کار و ڕەوتی ڕوانین و پشکنین (پزیشکی) ٢. کاری پشکنینی تووتن کاتی فرۆشتنی ٣. کاری نرخ دانان بۆ تووتن ☰ ١. مُعاینه (پزشکی) ٢. بررسی توتون ٣. ارزیابی/ نرخ‌گذاری توتون

▣ **فەحس کردن**: ڕوانین و پشکنین ☰ بررسی کردن

**فەحل / feĥl/**: ئاوەڵناو. ١. تایبەتمەندی هەر حەیوانە نێرێک کە دەخرێتە سەر مێوینە بۆ تۆم لێ گرتنەوە ٢. */کینایە/* ئازا و بەکار ☰ ١. گُشن ٢. شجاع و کاری

**فەحە / feĥe/**: ئاوەڵناو. */پلار/* هەپلەگون؛ دەبەنگ؛ گێل ☰ ابله

**فەخ / fex/**: ناو. خەفک؛ تەڵەی ئاسن ☰ تله‌ی آهنی

**فەخر / fexr/**: ناو. ١. شانازی ٢. جێی شانازی ☰ ١. افتخار ٢. مایه‌ی افتخار

▣ **فەخر فرۆشتن**: خۆ هەڵکێشان؛ بە خۆ نازین ☰ فخر فروختن

**فەخفووری / fexfûrî/**: ناو. فەرفووری؛ فەغووری؛ دەفری چینی ☰ ظرف چینی

**فەداندەر / fedander/**: ناو. بەدیهێنەر؛ داهێنەر ☰ مُخترع

**فەدۆک / fedok/**: ئاوەڵناو. فەدیۆک؛ فەهۆ؛ فەهیتۆ؛ شەرمن؛ شەرمین؛ شەرمێون ☰ خجالتی

**فەدەر / feder/**: ناو. گزە؛ فێڵ؛ کەڵەک ▣ کَلَک

**فەدی / fedî/**: ناو. شەرم؛ خەجاڵەت ▣ آزرم

**فەدیکار / fedîkar/**: ئاوەڵناو. فهێتکار؛ فهێدکار؛ شەرمەزار؛ خەجاڵەت ▣ شرمسار؛ آزرمگین

**فەدیکاری / fedîkarî/**: ناو. شەرمەزاری ▣ شرمساری

**فەدیۆک / fedyok/**: ☜ **فەدۆك**

**فەر / fer/**: ئاوەڵناو. تاک؛ تاق ▣ فرد (مقابل زوج)

**فەرا / fera/**: ناو. دەفری بەردەستان بۆ بە کار هێنان ▣ ظرف دم دست

**فەراجە / ferace/**: ناو. فەرەنجی ژنانە؛ پاڵتاوی لباد، تایبەتی ژنان ▣ پالتو زنانە

**فەراخشۆ / feraxşo/**: ناو. قاپشۆر؛ دەسرەیەک کە دەفری پێ پاک دەکەنەوە ▣ پارچەی تمیز کردن ظروف

**فەراژ / feraj/**: ☜ **فراژ**

**فەراژوو / ferajû/**: ☜ **فراژی**

**فەراژی / ferajî/**: ☜ **فراژی**

**فەراش / feraş/**: ناو. بەراش؛ بەرداش ▣ سنگ آسیاب

**فەراشتە / feraşte/**: ☜ **فەراشە**

**فەراشۆ / feraşo/**: ناو. شیلاوک؛ هەوێن؛ ئامێژەن ▣ پنیرمایە

**فەراشە / feraşe/**: ناو. فەراشتە؛ گۆڵە؛ کلیل و گۆڵە ▣ قفل چوبین در

**فەراق / feraq/**: ناو. مەرگ ▣ مرگ

▣ **فەراق لێ برین**: /کنایە/ مراندن؛ ساردکردنەوە؛ کوشتن ‹مارەکانیش هەموو کۆرەمار ... بوون کە پێوەدانیان یەکاویەکە و گامێشیش فەراق لێ دەبڕێ «هەژار، چێشتی مجێور»› ▣ کُشتن

**فەراقە / feraqe/**: ☜ **فەلاقە**

**فەراقەت / feraqet/**: پێرز. ← **فەقەتوفەراقەت**

**فەرامۆش / feramoş/**: ئاوەڵناو. لە بیرچوو؛ لە بیر کراو؛ لە بیر نەماو؛ لە بیرەو چووگ. هەروەها: **فەرامۆش بوون؛ فەرامۆش کردن** ▣ فراموش

**فەرامۆشکار / feramoşkar/**: ئاوەڵناو. ژبیرکەر؛ بێبیر؛ تایبەتمەندی مرۆیێ کە زوو شتی لە بیر دەچێ هەروەها: **فەرامۆشکاری** ▣ فراموشکار

**فەرامۆشکراو / feramoşk(i)raw/**: ☜ **لەبیرکراو**

**فەرامۆشی / feramoşî/**: ناو. ١. ژبیرکری؛ دۆخی شت لە بیر چوون ٢. سەبووری؛ دۆخی دڵ ئارام بوونەوە و دامرکان ▣ ١. فراموشی ٢. صبوری

▣ **فەرامۆشی هاتن**: لە بیر چوونەوەی خەم و مەینەت ▣ صبوری آمدن

**فەراهەم / ferahem/**: ئاوەڵناو. ئامادە؛ تەیار ▣ فراهم

**فەرتەنە / fertene/**: ناو. ١. فرتوونە؛ فرتوونەک؛ فرتەنە؛ فرتێنە؛ ڕەوتی شێوان و تێکەوە هاویشتنی دەریا ‹لەو فەرتەنە کەشتییەکە وەرگەڕا و کەس دەرنەچوو!› ٢. /کنایە/ ئاژاوە و پشێوی ‹بوو بە هەرا و فەرتەنەیەک، مەپرسە!› ▣ ١. طوفان دریایی ٢. آشوب و بلوا

**فەرحانی / ferĥanî/**: ناو. فەرعانی؛ فەرعانەتی: ١. هەرزانی و شتزۆری ٢. بارودۆخی باش و لەبار لە دوای ڕەوتێکی سەخت و دژوار ▣ ١. ارزانی و فراوانی ٢. گُشایش

**فەرخ[١] / ferx/**: ناو. فەرخە؛ بێچووی باڵندە و گەلێک لە جانەوەران ▣ جوجەی پرندگان و بچەی بسیاری از جانوران

**فەرخ[٢]**: ئاوەڵناو. پیرۆز؛ ممبارک ▣ مبارک

**فەرخە / ferxe/**: ناو. ١. ☜ **فەرخ ـ١** ٢. جۆرێ ماسی ▣ ١. ☜ **فەرخ ـ١** ٢. نوعی ماهی

**فەرخەس / ferxes/**: ئاوەڵناو. نیوەئێختە ▣ حیوان نیم اختە

**فەرخی / ferxî/**: ناو. جۆرێ ترێ ▣ نوعی انگور

**فەرد[١] / ferd/**: ناو. بەیت؛ دێڕێکی شیعر، بریتی لە دوو باڵ ‹مەنعم مەکەردێ گرانەن دەردم/ ئەر شێویابۆ قافیەی فەردم «مەولەوی»› ▣ بیت

**فەرد**[٢]: ئاوەڵناو. تاقانە؛ بێوێنە ☰ بی‌همتا

**فەردە / ferde/**: ناو. تابار ☰ لنگه‌بار

**فەردەش / ferdeş/**: ناو. کار و ڕەوتی کوت ـ کوت کردنی سووری خەرمان ☰ تقسیم خرمن به چند قسمت مساوی

**فەرز**[١] **/ ferz/**: ناو. ١. وەزیر؛ فەرزین؛ داشی لە گش داشان بە کارتر لە شەترنجدا ٢. کاری ڕۆیشتن بە دزییەوە ٣. فەرز؛ گریمان؛ بابەتێ کە بۆ مەبەستێک بە ڕاستی دانێن بێ ئەوەی سەلمابێ ☰ ١. وزیر شطرنج ٢. عمل جیم شدن ٣. فرض

⊡ **فەرز کردن**: وا دانان؛ وا گرتن ‹فەرز کەین وا بێ تۆ دەڵەی› ☰ فرض کردن

**فەرز**[٢]: ئاوەڵناو. ١. فرز؛ ڕێک و لەبار و بەرچاو ٢. فەرز؛ پێویست؛ واجب ☰ ١. شیک ٢. واجب

⊡ **فەرز بوون**: لە سەر بوون؛ ئەرکی سەر شان بوون ‹نوێژ خوێندن لە سەر موسڵمانان فەرزە› ☰ واجب بودن

**فەرز**[٣]: ئاوەڵکار. گریمان؛ کردمان؛ بگرە؛ هاتوو؛ وام دانا ‹فەرز ئەم کارەشت بۆ بکەم، تۆ چ دەکەی؟› ☰ فرضاً

**فەرز**[٤]: پێرۆ. ← قەرز و فەرز

**فەرزۆ / ferzo/**: ناو. ڕۆڵە؛ عەولاد ☰ فرزند

**فەرزەند / ferzend/**: ☜ فرزەند

**فەرزین**[١] **/ ferzîn/**: چاوگ. دەرچوون و خوشکاندن ☰ جیم شدن

**فەرزین**[٢]: ☜ فەرز[١]ـ١

**فەرژ / ferj/**: ئاوەڵناو. دڕاو؛ دڕیاگ ☰ پاره

**فەرژاندن / ferjandin/**: چاوگ. ١. دڕین؛ دادڕین ٢. پرماندنی ئەسپ؛ دەنگ لە لووت هاتنی ئەسپ بۆ داوای ئالف ☰ ١. پاره کردن ٢. صدا درآوردن اسب از بینی هنگام طلب علف

**فەرژین / ferjîn/**: چاوگ. ١. دڕان؛ دڕیان ٢. پرماندن؛ پرمانن (ئەسپ) ☰ ١. پاره شدن ٢. از بینی صدا درآوردن (اسب)

**فەرسە / ferse/**: ناو. پنە؛ تەختەپانی نانکەر بۆ ئەنگوتک پان کردنەوە ☰ تخته‌ی زیر نورد نانوایی

**فەرسەت / ferset/**: ☜ فرسەت

**فەرسەخ / fersex/**: ☜ فرسەخ

**فەرسەند / fersend/**: ناو. دەرفەت؛ کێس؛ هەل ☰ فُرصت

**فەرش / fer(i)ş/**: ☜ فەڕش

**فەرشک / ferşik/**: ناو. جومگەی دەست ☰ مُچ دست

**فەرعانەتی / fer'anetî/**: ☜ فەرحانی

**فەرعانی / fer'anî/**: ☜ فەرحانی

**فەرعی / fer'î/**: ئاوەڵناو. ١. لاوەکی؛ ناسەرەکی؛ پەلەکی ٢. ناگرنگ؛ کەمبایەخ ☰ ١. فرعی ٢. بی‌اهمیت

**فەرغون / ferğun/**: ناو. فارگۆن؛ فێرغون؛ ناسرگە؛ عەرەبانە؛ فرغوون؛ قالاکەر؛ گوهێز؛ ئامرازێکی گچکەی یەک کەسی بە چەرخێک و دووپایە و دوو دەستەوە بۆ گواستنەوەی خاک و بەرد و زبڵ و زاڵ ☰ فرغون

**فەرفووت / ferfût/**: ئاوەڵناو. ١. پەڕپووت؛ کۆنەی دڕاو ٢. ڕزیو؛ داڕزیو؛ پرتووکاو ☰ ١. فرسوده ٢. پوسیده

**فەرفووری / ferfûrî/**: ☜ فەخفووری

**فەرق / ferq/**: ناو. ١. جیاوازی ٢. بێهۆشی ٣. هێڵی ناوەڕاستی قژە سەر ☰ ١. فرق؛ تفاوت ٢. بیهوشی ٣. فرقِ سر

⊡ **فەرق بوون/ هەبوون**: جیاوازی بوون/ هەبوون ‹بچم یا نەچم فەرقی نییە› ☰ تفاوت داشتن

**فەرق چی بوون**: فەرق نەکردن؛ جیاواز نەبوون ‹کە من کەر بم، بارەبەر بم/ کورتان لە پشت، هەش بە سەربم/ فەرقی چییە؟ دەرد هەر دەردە/ کەری تۆ بم یا هی جەردە «پەشێو»› ☰ چه فرق داشتن

**فەرق خستن**: ☜ فەرق نان

**فەرق دانان:** ☜ **فەرق نان**

**فەرق کردن:** ۱. جیاواز بوون ۲. جیایی دانان ‹ئەوەندە تەسکە بیری گەندەپیاوان/ دەکەن فەرقی کچی میران و گاوان «هێمن»› ☰ ۱. فرق داشتن ۲. فرق گذاشتن

**فەرق نان:** فەرق خستن؛ فەرق دانان؛ بە شێوەی جیاواز هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ چەن کەسدا ‹تۆ فەرق ئەنیتە بەین منالەکان› ☰ تفاوت قایل شدن

**فەرق نەکردن:** ☜ **فەرق چی بوین**

**فەرقان**[1] / ferqan/: چاوگ. ۱. بێهۆش بوون؛ بوورانەوە ۲. قورگ گیران لە خەمان ☰ ۱. از هوش رفتن ۲. گلو گرفتن از غم

**فەرقان**[2]: ناو. بێهۆشی؛ دۆخی بوورانەوە ☰ غش

⊡ **فەرقان کردن:** دیق کردن ☰ دِق کردن

**فەرقرین** / ferq(i)řîn/: چاوگ. دەرپەڕینی خیز و چەو ☰ دررفتن سنگریزە

**فەرک** / ferk/: ناو. ۱. ڕوونووس ۲. زانستی شتی گران ۳. فەرمان؛ ئەمر ٤. هەنگی مێچکەی کارکەر ٥. تاق؛ ڕەفە ☰ ۱. رونویس ۲. علم به مسائل بُغرنج ۳. فرمان؛ دستور ۴. زنبور کارگر ۵. رفه

⊡ **فەرک کردن:** چارەسەر کردن ‹ئەو کێشەیەم بۆ فەرک ناکرێ› ☰ حل کردن

**فەرکار** / ferkar/: ناو. فەرمان ڕاگەیێن ☰ ابلاغ کننده

**فەرکان** / ferkan/: ناو. ۱. ڕوونووسی ۲. فەرمان؛ ئەمر ☰ ۱. رونویسی ۲. فرمان؛ دستور

**فەرکاندن** / ferkandin/: چاوگ. ۱. ڕوونووسی کردن؛ لە بەر نووسینەوە ۲. فەرمان دان؛ ئەمر کردن ۳. پێزانین؛ هەڵاوردن ☰ ۱. رونویسی کردن ۲. فرمان دادن ۳. حل کردن مُعما

**فەرکانە** / ferkane/: ناو. لاسایی؛ چاولێکەری ☰ تقلید

**فەرکۆشین** / ferkoşîn/: چاوگ. ۱. سەرکەوتن؛ بە ئاکام گەیشتن ۲. ڕاژاندن؛ ڕاژانن؛ لەراندن؛ شەکاندن ☰ ۱. موفق شدن ۲. به اهتزاز درآوردن

**فەرکەم** / ferkem/: ناو. نەخۆشی خووداری ☰ بیماری صرع

**فەرکین** / ferkîn/: چاوگ. ۱. حەل بوون ۲. گۆڕینەوەی کۆن بە تازە ☰ ۱. حل شدن ۲. عوض کردن کُهنه با نو

**فەرمان** / ferman/: ناو. ۱. ئەمر؛ عەمر؛ فەروار؛ فەرک؛ فەرکان؛ دەستوور؛ هەرمانە؛ قسە یان نووسراوەیەک کە بە پێی ئەوە کارێک لە ژێردەستێک داواکراوە ۲. کار؛ ئیش ۳. ڕۆڵ؛ کەرەسەیەک لە ماشیندا کە ئاژۆر بە سووڕدانی ئەملا و ئەولا دەکا ☰ ۱. فرمان؛ حُکم ۲. کار؛ شُغل ۳. فرمان اتومبیل

⊡ **فەرمان دان:** ئەمر کردن ؛ ئەرک سپاردن (بە کەسێ) ☰ فرمان دادن

**فەرمان کردن/ کرن:** ۱. فەرمان دان ۲. کار کردن ☰ ۱. فرمان دادن ۲. کار کردن

**فەرمانبەر** / fermanber/: ناو. فرمانبەر: ۱. کەسێ کە ئەرکی دەسەلاتدار پێک دێنێ ۲. کارمەند؛ مووچەخۆری دەوڵەت ☰ ۱. تحت امر ۲. کارمند

**فەرمانبەردار** / fermanberdar/: ناوەڵناو. بەڕێوەبەری فەرمانی لە خۆ گەورەتر ☰ فرمانبردار

**فەرمانبەری** / fermanberî/: ناو. گوێڕایەڵی؛ بەرفەرمانی ☰ فرمانبرداری

**فەرماندار** / fermandar/: ناو. ۱. کەسێ کە دەتوانێ فەرمان بە خەڵک بدا ۲. ئەوەی سەرۆکایەتی هێزی بەڕێوەبەری شارێکی لە ئەستۆدایە ☰ ۱. صاحب امر ۲. فرماندار

**فەرماندە** / fermande/: ناو. فەرماندەر؛ سەرکردە؛ سەرپەل؛ قوماندار؛ کەسێ کە سەرۆکایەتی و ڕێبەری تاقمێکی چەکداری وەئەستۆیە ☰ فرماندە

**فەرماندەر** / fermander/: ☜ **فەرماندە**

**فەرمانڕەوا** / fermanřewa/: ناو. ڕاژۆر؛ خاوەن دەسەلات ☰ فرمانروا

**فەرمانگوزار** / fermanguzar/: ☜ **کارگوزار**

**فەرمانگە** / fermange/: ناو. ١. کارگێڕی؛ جێگەی کار و باری دەوڵەتی ٢. جێگەی کار ☰ ١. اداره ٢. محل کار

**فەرمانگێڕ** / fermangêř/: ناو. کارگێڕ؛ مدیر؛ کەسێ کە بە کار و باری فەرمانگە ڕادەگا ☰ مُدیر

**فەرمانە** / fermane/: ناو. جلیسقە؛ لیباسێکە وەک سوخمە دەبەر دەکرێ ☰ جلیقه

**فەرماوای** / fermaway/: چاوگ. فەرموون ☰ فرمودن

**فەرمایش** / fermayiş/: ناو. فەرمایشت؛ فەرموودە؛ لەبز؛ وارم؛ کەلام؛ قسە یان فەرمانی کەسێکی گەورەی خاوەن ڕێز ☰ فرمایش

**فەرمایشت** / fermayişt/: ☜ **فەرمایش**

**فەرموودە** / fermûde/: ☜ **فەرمایش**

**فەرموون** / fermûn/: چاوگ. تێپەڕ. //فەرمووت؛ دەفەرمووی؛ بفەرموو// فەرمین: ١. گوتن؛ وتن بە ڕێزەوە ٢. خولک کردن (بۆ خواردن یان کاری تر) ☰ ١. فرمودن ٢. تعارُف کردن (به خوردن یا کارهای دیگر)

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێی: نەفەرموون

**فەرمی** / fermî/: ئاوەڵناو. ڕەسمی: ١. سازگار و هاوڕەنگ لەگەڵ قانوون و ڕێوزێی وەرگیراودا ‹بەرگی فەرمی› ٢. بەپێی قانوون یان نەریتی جەماوەر ‹وتووێژی فەرمی› ☰ ١و٢. رسمی

**فەرمین** / fermîn/: ☜ **فەرموون**

**فەروار** / ferwar/: ناو. ١. حوکم؛ بڕیار ٢. فەرمان؛ دەستوور؛ ئەمر ٣. ئاران؛ هەوارگەی زستانی کۆچەران ☰ ١. حُکم ٢. فرمان ٣. قشلاق

**فەروە** / ferwe/: ناو. کەوڵی تیسکن؛ پاڵتۆی لە پێستە مەڕ بە خورییەکەیەوە ☰ پوستین

**فەروو** / ferû/: ناو. کەپەنەک ☰ بالاپوش نمدی

**فەرەج** / fereç/: ناو. ١. دەرەتان؛ ڕزگاری لە تەنگانە ٢. فێڵ؛ حیلە ‹فێڵ و فەرەج› ☰ ١. فرج؛ گشایش ٢. نیرنگ

⊡ **فەرەجێک حاسڵ بوون**: دەرەتانێک دەرکەوتن؛ ڕێچارێک بۆ ڕزگاری پەیدا بوون ☰ گشایشی در کار شدن

**فەرەجی** / fereçî/: ☜ **فەرەنجی**

**فەرەز** / ferez/: ناو. شیرنیاتێکە ☰ نوعی شیرینی

**فەرەشخانە** / fereşxane/: ناو. بێڵی پانی پەین ماڵین ☰ نوعی پاروی پهن

**فەرەقنای** / fereqnay/: چاوگ. فرەقاندن ☰ متلاشی کردن

**فەرەقیای** / fereqyay/: چاوگ. فرەقین ☰ متلاشی شدن

**فەرەک** / ferek/: ناو. دەستاڕ؛ لنگە دەستاڕ ☰ آسیای دستی

**فەرەنجی** / ferencî/: ناو. فەرەجی؛ پۆشەنی بێباڵی بەرگن ☰ نوعی بالاپوش بی‌آستین نمدی

**فەرەنگ** / fereng/: ناو. ١. ☜ **فەرهەنگ ـ٢** ٢. ڕۆژاوا؛ ناوی گشتی بۆ وڵاتانی ئەورووپایی ☰ ١. ☜ **فەرهەنگـ٢** ٢. فرنگ

**فەرەنگی**[1] / ferengî/: ئاوەڵناو. پێوەندیدار بە وڵاتانی ئورووپاییەوە ☰ فرنگی؛ غربی

ـ **فەرەنگی**[2]: پاشەوشە. سەر بە فەرەنگ ‹تووەفەرەنگی› ☰ ـ فرنگی

**فەرەوفۆل** / fere w fol/: ☜ **فەرەوفۆڵ**

**فەرەوفۆڵ** / fere w foł/: ناو. فەرەوفۆل؛ فۆڵوفەرە؛ دەفر و ئامان؛ قاپ و قاچاغ ☰ ظرف و ظروف

**فەرەه** / fereh/: ئاوەڵناو. پان؛ هەراو؛ گوشاد ☰ گشاد؛ فراخ

**فەرە** / ferh/: ناو. ترس ☰ ترس

**فەرهان** / ferhan/: چاوگ. فەرهین؛ ترسان 🇮🇷 ترسیدن

**فەرهاندن** / ferhandin/: چاوگ. بزداندن؛ ترساندن 🇮🇷 ترسانیدن

**فەرهەم** / ferhem/: ناو. بەرهەم؛ فەراهەم 🇮🇷 فراهم

**فەرهەنگ** / ferheng/: ناو. ۱. ئاوەز؛ عەقڵ ۲. فەرەنگ؛ وشەنامە؛ کتێبێک کە وشە و دەستەواژەی زمانێکی تێدا ڕیز کراوە و شێوەی خوێندنەوە و ڕەگەز و باری ڕێزمانی و ... هەرکامی تێدا ڕوون کراوەتەوە و هەر بەو زمانە یان بە زمانێکی تر مانای لێکدراوەتەوە ۳. ڕست؛ هۆرتە و بەرە؛ کولتوور؛ دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی لە داب و نەریت، بیر و بۆچوون، هونەر و لێهاتوویی و شێوازی ژیان کە لە درێژەی ئەزموونی مێژوویی گەلاندا ڕەنگ دەگرێ و بۆ بەرەی داهاتوو دەمێنێتەوە ٤. *[گفتاری]* چاند؛ ئاکاری شیاو و گونجاو بەپێی داب و نەریتی کۆمەڵگا 🇮🇷 ۱. شعور ۲. فرهنگ لغت یا اعلام ۳و۴. فرهنگ

**فەرهەنگنووسی** / ferhengnûsî/: ناو. ۱. لقێک لە زانستی وێژەوانی کە دەپەرژێتە سەر شێوەی کۆکردنەوە، تۆژینەوە، پۆلێن و ڕاڤەی وشەی زمانێک یان لقێکی زانستی ۲. کاری نووسینی فەرهەنگ 🇮🇷 ۱و۲. فرهنگ‌نویسی

**فەرهەنگۆک** / ferhengok/: ناو. وشەدانی چکۆلە 🇮🇷 لغتنامەی مختصر

**فەرهەنگی** / ferhengî/: ناوەڵناو. سەر بە فەرهەنگ ‹چالاکی فەرهەنگی› 🇮🇷 فرهنگی

**فەرهین** / ferhîn/: ☜ فەرهان

**فەرهێت** / ferhêt/: ناو. بەردی بناغە 🇮🇷 سنگ بنا

**فەریا** / ferya/: ☜ فریا

**فەریاڕەس** / feryařes/: ☜ فریاڕەس

**فەریح** / ferîḧ/: ناوەڵناو. بەرفراوان؛ هەراو 🇮🇷 وسیع

**فەریقەت** / ferîqet/: ناو. ڕەزامەندی 🇮🇷 بسندگی

**فەریک** / ferîk/: ناوەڵناو. فریک؛ تەواو نەگەیشتوو ‹جەنگەی قەزوانی فەریک بوو «هەژار؛ چێشتی مجێور»› 🇮🇷 دلمل؛ نیمرس

**فەریکە** / ferîke/: ناو. دانەوێڵەی فەریک 🇮🇷 غلە و دانەی دلمل

**فەریکەبادام** / ferîkebadam/: ناو. چەقالە بادام 🇮🇷 چغالە بادام

**فەریکەجۆ** / ferîkeco/: ناو. جۆشیرە؛ جۆشیلە 🇮🇷 جو نرسیدە

**فەریکەچایی** / ferîkeçayî/: ناو. چایی دەم نەکێشاو؛ چایی پەپوولە بە سەر؛ چاییەک وردە پڵتەی بە سەرەوە بێ 🇮🇷 چای دم‌نکشیدە

**فەریکەڕۆن** / ferîkeřon/: ناو. کەرە؛ ڕۆنەکەرە؛ ئونیشک؛ نفیشک 🇮🇷 کره

**فەریکەکەشک** / ferîkekeşk/: ناو. حەلیم؛ جۆرێ کەشک 🇮🇷 نوعی کشک

**فەریکەنۆک** / ferîkenok/: ناو. نۆکەزۆردە 🇮🇷 نخود دلمل

**فەڕ**[1] / feř/: ناو. ۱. ودم؛ پیرۆزی؛ ممبارەکی ‹ناگا شۆڵەی خوەر سوب فەردا فەڕ دا/ وە سەر بەرز هەرد وە دەشت و دەردا «مەولەوی»› ۲. بەهرە؛ قازانج؛ فایدە 🇮🇷 ۱. فر؛ یُمن ۲. فایدە

▪ **فەڕ**[2]: پاشەوشە. ودم؛ پیت ‹بەدفەڕ› 🇮🇷 ـ یُمن

**فەڕاش** / feřaş/: ناو. بەردەست؛ پیاوی خزمەتکار 🇮🇷 فرّاش

**فەڕاشین** / feřaşîn/: ناو. بای فێنکی هاوینان 🇮🇷 باد خُنک در تابستان

**فەڕانسەوی**[1] / feřansewî/: ناو. ۱. خەڵکی فەڕانسە ۲. زمانی ئەو خەڵکە، لقێ لە زمانە ئورووپاییەکان لە زمانگەلی هیندوو- ئورووپایی 🇮🇷 ۱و۲. فرانسوی

**فەڕانسەوی**[2]: ناوەڵناو. سەر بە فەڕانسە ‹چێشتی فەڕانسەوی› 🇮🇷 فرانسوی

**فەڕانسی** / feřansî/: ناوەڵناو. گالیک؛ سەر بە

فەڕانسە ☱ گالیک

**فەڕتووت** / feřtût/: ئاوەڵناو. فۆرتووت؛ فەڕتووس؛ زۆرهان؛ پیری پەککەوتە ☱ فرتوت

**فەڕتووس** / feřtûs/: ☜ **فەڕتوت**

**فەڕدار** / feřdar/: ئاوەڵناو. ١. بەبەهرە؛ بەفایدە ٢. پیرۆز؛ ممبارەک؛ بەودم ☱ ١. مُفید ٢. فرخُنده

**فەڕز**[١] / feřz/: ☜ **فەرز**[١]**ـ٣**

**فەڕز**[٢]: ئاوەڵناو. *[شەرع]* پێویست؛ ئەرکی خوایی ☱ واجب؛ فرض

**فەڕز**[٣]: ئاوەڵکار. گریمان؛ کردمان؛ بگرە؛ هاتوو؛ وام دانا ☱ فرضاً؛ گیرم

**فەڕش** / feř(i)ş/: ناو. فەرش؛ ڕایەخ ☱ فرش

⊡ **فەڕش کردن**: ١. ڕایەخ داخستن ٢. ڕێگە سەنگفەڕش کردن ☱ ١. فرش گستردن ٢. سنگفرش کردن

**فەڕفەڕ** / feřfeř/: دەنگەناو. دەنگی باڵ لێکدانی مەل ☱ صدای بال برهم زدن پرنده

**فەڕک** / feřk/: ئاوەڵناو. گوشراو لە ناو دەستدا ☱ مُچاله

**فەڕکان** / feřkan/: چاوگ. پشاوتن؛ گلۆفیان ☱ مُچاله شدن

**فەڕکاندن** / feřkandin/: چاوگ. پشاوتن؛ گلۆفین ☱ مچاله کردن

**فەڕمەسۆن** / feřmeson/: ناو. کەسی بە ڕواڵەت و بیر و بۆچوونی ئورووپاییانەوە ☱ مُقلد اروپاییان

**فەڕنگی** / feřingî/: ناو. سفلیس؛ هالۆق؛ بای بوور؛ پەتای کۆنکردووی ئەندامانی شەرم ☱ سفلیس

**فەڕوفیت** / feř û fit/: ناو. خێر و بەرەکەت ☱ یُمن و سعادت

**فەڕووج** / feřûc/: ☜ **فڕوج**

**فەڕووچ** / feřûç/: ☜ **فڕوج**

**فەڕەژان** / feřejan/: چاوگ. فەڕەژین؛ دڕان ☱ پاره شدن

**فەڕەژاندن** / feřejandin/: چاوگ. دڕاندن؛ دڕانن ☱ پاره کردن

**فەڕەژین** / feřejîn/: ☜ **فەڕەژان**

**فەڕەنگ** / feřeng/: ناو. ١. وڵاتی ئورووپا ٢. خەڵکی ئورووپا ☱ ١. اروپا ٢. اروپایی

**فەڕەنگسان** / feřeng(i)san/: ☜ **فەڕەنگستان**

**فەڕەنگستان** / feřengistan/: ناو. فەڕەنگسان؛ وڵاتانی ئورووپا ☱ اروپا

**فەڕەنگی**[١] / feřengî/: ناو. ئاتەشەک؛ جۆرێ سووزەنەکی زۆر پیس ☱ آتشک؛ نوعی بیماری آمیزشی

**فەڕەنگی**[٢]: ئاوەڵناو. ١. سەر بە ئورووپا ٢. دانیشتووی وڵاتانی ڕۆژاوا ☱ ١و٢. فرنگی

**فەزیحەت** / fezîĥet/: ناو. فەزیعەت؛ فەزێحەت؛ بێئابڕوویی؛ ئابڕووتکاوی؛ ناوزڕاوی ☱ رسوایی

**فەزیعەت** / fezî'et/: ☜ **فەزیحەت**

**فەزێحەت** / fezêĥet/: ☜ **فەزیحەت**

**فەساد**[١] / fesad/: ناو. دەستدرێژی بۆ سەر ژنی بێگانە ‹دەڵێن ژنان فەساد دەکەن› ☱ تجاوز جنسی

**فەساد**[٢]: ئاوەڵناو. شەڕهەڵایسێن؛ ئاژاوەچی ‹پیاوێکی فیتنە و فەسادە› ☱ فتنەانگیز؛ آشوبگر

**فەساڵ**[١] / fesał/: ناو. ١. تەرح و دیدار؛ بیچم ‹چ خۆشە هێزی ڕەنجبەر ڕابماڵێ/ قەڵا و زیندانی ئاغای بەدفەساڵم «قانع»› ٢. جێبەجێیی؛ ئەنجام ‹بۆ شاعیرێک کە گیانی، لێی هەڵئەقوڵا جوانی/ ئەگەرچی هۆی بەختی خۆی، جوانی فەساڵ نەبوو بۆی «گۆران»› ٣. تەرزی دروونی جلک لای خەیات ☱ ١. قیافە؛ ریخت ٢. انجام ٣. نوع برش و دوخت لباس توسط خیاط

⊡ **فەساڵ دان**: پێکهێنان؛ ئەنجامدان ☱ انجام دادن

**فەساڵ**[٢]: ئاوەڵکار. شێنەیی؛ هێدیکا ☱ یواشکی

**فەسڵ** / fes(i)ł/: ناو. ١. کڕ؛ وەرز؛ پاژێ لە چوار پاژێ ساڵ ‹فەسڵی هاوینی جەهەننەم، فەسڵی

ئیستای زەمهەریر/ زەمهەریر کەی وا بە تەنسیرە و جەهەننەم وا بە تاو؟ «نالی»» ٢. جەنگە؛ هەرەت ‹ئانە گشت جە وەخت نادانیم بیەن/ فەسل سەرمەستی و جوانیم بیەن «ئەحمەد بەگی کۆماسی»» ٣. سات؛ کات؛ وەخت ‹گەوهەر بیم ئەو فەسل کنیام نە سەدەف/ جسم مەلەک بیم، وێم کەرد وە کەشەف «میرزا شەفیع کولیایی»» ٤. باسێکی سەربەخۆ لە پەڕاودا ‹لە دیباچەی کیتابی حوسنی عالەم هەر وەرەق لا دەم/ دەبینم مەبحەسی وەسفت لە هەر فەسل و لە هەر بابێ «بەیتووشی»» * هەروەها: **فەسڵی** ☰ ١. فصل (سال) ٢. موسم ٣. هنگام ۴. فصل (کتاب)

**فەعلە / fe'le/**: ناو. فاعلە؛ عەمەلە ☰ کارگر

**فەعوولون / fe'ûlun/**: ناو. بناغەیەکی شیعری عەرووزی ☰ فعولُن

**فەعیلاتون / fe'îlatun/**: ناو. بناغەیەکی شیعری عەرووزی ☰ فعلاتُن

**فەغوو / feğû/**: ناو. هاوار؛ هەڤاز؛ ناڵە و گریان بە نیشانەی ناڕەزایەتی لە شتێ ☰ فغان

**فەغووری / feğûrî/**: ☜ فەخفووری

**فەق / feq/**: ناو. فاق؛ جۆرێ داو بۆ مەل ڕاو کردن ☰ نوعی دام برای شکار پرندگان

**فەقفەقە / feqfeqe/**: ناو. نەخۆشینی مەترسیدار ☰ بیماری خطرناک

**فەقە / feqe/**: ☜ فەقێ

**فەقەت / feqet/**: ئاوەڵکار. هەر؛ تەنیا ☰ فقط

**فەقەت و فەراقەت / feqet û feraqet/**: ئاوەڵکار. تاق و تەنیا ☰ تک و تنها

**فەقی / feqî/**: ☜ فەقێ

**فەقیانە / feq(i)yane/**: ناو. ئانگوچک؛ ئەنگوچک؛ لەوەندی؛ سەرقۆڵی شۆڕ لە کراسی ژن و چۆخەی پیاودا ☰ نوعی سر آستین بُلند در لباس کُردی

**فەقیر[1] / feqîr/**: ناو. ١. نازناوی مەلای ئێزەدی ٢. تیرەیەکی ئێزەدی ☰ ١. لقب روحانی ایزدی ٢. طایفه‌ای از عشایر ایزدی

**فەقیر[2]**: ئاوەڵناو. ١. هەژار؛ بێماڵ ٢. بێئازار ☰ ١. بینوا ٢. بی‌آزار

**فەقیرحاڵ / feqîrĥał/**: ئاوەڵناو. فەقیرۆکە؛ گێلۆکە ☰ ساده‌لوح

**فەقیرخانە / feqîrxane/**: ناو. هەژارخانە؛ ماڵێ کە لە سەردەمی گرانیدا هەژاری لێ بەخێو دەکەن ☰ نواخانه

**فەقیرۆکە / feqîroke/**: ☜ فەقیرحاڵ

**فەقیری / feqîrî/**: ناو. ڕووتی؛ ناگوزووری؛ نەبوونی ☰ فقر

**فەقیەتی / feq(i)yetî/**: ☜ فەقێیەتی

**فەقێ / feqê/**: ناو. فەقە؛ فەقی؛ فەگەه؛ دەرسخوێنی مزگەوت ‹بە بڕوای من فەقێ تا نەبوونەتە مەلا، میللەتێکی سەربەخۆن «هەژار، چێشتی مجێور»» ☰ طلبه

**فەقێتی / feqêtî/**: ☜ فەقێیەتی

**فەقێیانە / feqêyane/**: ناو. سۆرانی؛ ئاسوێنە ☰ سرآستین بلند

**فەقێیەتی / feqêyetî/**: ناو. فەقێتی؛ فەقیەتی؛ تەڵەبەیی؛ خوێندن لای مەلا ‹دەڵێن نافیع مەزهەر لە هەڵەبجە فەقێیەتی کردووە ... «هەژار، چێشتی مجێور»» ☰ طلبگی

**فەکار / fekar/**: ناو. کار و ڕەوتی بیری زۆر کردنەوە و ڕامان ☰ اندیشه

**فەکاندن / fekandin/**: چاوگ. قەتاندن؛ قرتاندن؛ پساندن؛ قوتانن ☰ قطع کردن

**فەکس / feks/**: ناو. فاکس؛ دوورنڤیس ☰ فاکس

**فەکلە / fekle/**: ☜ فکلە

**فەگەه / fegeh/**: ☜ فەقێ

**فەلا / fela/**: ناو. ١. مەسیحی؛ کریستیان ٢. جووتیار؛ کەشاوەرز ☰ ١. مسیحی ٢. کشاورز

**فەلات / felat/**: ناو. ١. ڕزگاری ٢. ئازادی ☰ ١. رستگاری ٢. آزادی

**فەلاتی / felatî/**: ناو. خاچپەرەستی ☰ مسیحیت

**فەلاح / felaĥ/**: ناو. بەزرگەر؛ وەرزێر؛ جووتبەندە ☰ برزگر

**فەلاحەت / felaĥet/**: ناو. کشتوکاڵ ☰ کشاورزی

**فەلاسک / felask/**: ☜ **فلاسك**

**فەلافل / felafil/**: ناو. فلافل؛ خۆراکێ لە ئاردەنۆک و بەهارات و بیباری تیژ کە لە ڕۆندا سووری دەکەنەوە ☰ فلافل

**فەلاقە / felaqe/**: ناو. فەراقە؛ فەلەقە؛ پەت و دارێکە لە پای تاوانباری دەپێچن و دارکاری دەکەن ☰ چوب فلک

⊡ **فەلاقە کردن**: دارکاری کردنی ژێر پێ ☰ فلک کردن

**فەلاکەت / felaket/**: ئاوەڵناو. ١. زۆر دژوار ٢. تەواو بڤە ☰ ١. بسیار سخت ٢. خیلی خطرناک

**فەلانی / felanî/**: ئاوەڵناو. وەک کریستیەنەکان ☰ مسیحی آسا

**فەلایی / felayî/**: ناو. جووتیاری؛ وەرزێری ☰ کشاورزی

**فەلتاندن / feltandin/**: چاوگ. ڕزگار کردن ☰ خلاص کردن

**فەلتین / feltîn/**: چاوگ. ١. خەلەستن؛ ڕزگار بوون ٢. لە دەست دەرچوون ٣. داڕسانی خوێنی لووت ☰ ١. خلاص شدن ٢. از دست رفتن ٣. خون‌دماغ شدن

**فەلج / felc/**: ☜ **فلَج[٢]-٢**

**فەلسەفە / felsefe/**: ناو. زانستی لێکدانەوەی گشتی و بنەڕەتی بابەتێک (وەک: بوون، ڕاستی، زانیاری، بایەخ، ئاوەز، زیری و زمان) بە گوێرەی بەڵگەی عەقڵانی و ژیرانە ☰ فلسفه

**فەلسەفی / felsefî/**: ئاوەڵناو. سەر بە فەلسەفە ‹قوتابخانەی فەلسەفی؛ بەڵگە هێنانەوەی فەلسەفی› ☰ فلسفی

**فەلشان / felşan/**: چاوگ. فەلشین: ١. ڕمان؛ ڕووخان؛ تێک‌تەپین ٢. پەرێشان بوون ☰ ١. خراب شدن ٢. پریشان شدن

**فەلشاندن / felşandin/**: چاوگ. ١. ڕماندن؛ ڕووخاندن ٢. شێواندن؛ پەرێشان کردن ☰ ١. خراب کردن ٢. پریشان کردن

**فەلشی / felşî/**: ئاوەڵناو. ڕووخاو؛ ڕماو ☰ خراب شده

**فەلشین / felşîn/**: ☜ **فەلشان**

**فەلق / felq/**: ناو. پاژ؛ لەت؛ پارچە ☰ تکه؛ قطعه

**فەلقاندن / felqandin/**: چاوگ. بەش کردن ☰ تقسیم کردن (سهم)

**فەلقین / felqîn/**: چاوگ. بەش بوون ☰ تقسیم شدن (سهم)

**فەلە[١] / fele/**: ناو. ١. فلە؛ فلە؛ فلەه؛ فەلا؛ مەسیحی؛ کریستیان ٢. فەعلە؛ پالە؛ عەمەلە ☰ ١. مسیحی ٢. کارگر

**فەلە[٢]**: ئاوەڵناو. شفتە؛ دانگۆ؛ بەبێ بەستە و دەفر ‹لووبیای فەلە› ☰ فلّە

**فەلە[٣]**: ئاوەڵکار. شفتە؛ دانگۆ؛ وە دانگۆ ‹فەلە سەندم› ☰ فلّە

**فەلەج / felec/**: ئاوەڵناو. ئیفلیج؛ شەپلەلێداو. هەروەها: **فەلەجی** ☰ فلج

**فەلەخوێ / felex(i)wê/**: ناو. جووتیار؛ وەرزێر ☰ کشاورز

**فەلەڕەشکە / feleřeşke/**: ناو. فلەی بۆرەپیاگ ☰ رعیّت مسیحی

**فەلەقە / feleqe/**: ☜ **فەلاقە**

**فەلەک / felek/**: ناو. فەڵەک: ١. ئاسمان ٢. چەرخ؛ خولگەیەک یان کۆمەڵێک لە تەنگەڵی ئاسمانی ٣. چۆنیەتی ڕەق بوونی ئەندام ☰ ١. آسمان ٢. فلک ٣. سفتی اندام

**فەلەکە / feleke/**: ناو. ١. فولکە؛ مەیدانی گچکە ٢. شێرفەلەکە؛ فەلەکە؛ شێرێکی سەر گرد بۆ بەستن و بەردانی تراو ⊑ ١. فلکه ٢. شیر فلکه

**فەلەیی / feleyî/**: ئاوەڵکار. وە دانگۆ؛ بەبێ بەستە و دەفر ⊑ فلّەای

**فەلیت / felît/**: ☜ فەلیتە

**فەلیتە / felîte/**: ناو. فەلیت؛ ژنی سەرسەری و بێشەرم ⊑ زن هرزه

**فەڵەک / fełek/**: ☜ فەلەك

**فەڵەکە / fełeke/**: ☜ فەلەکە ـ٢

**فەن / fen/**: ناو. ١. فێڵ؛ حیلە ٢. تەرز؛ جۆر ‹لەی فەنە درووسی کە!› ٣. ئادا؛ لمر؛ لمرە؛ ڕێوشوێنی کردنی کارێ کە فێر بوون و ئەزموونی پێویستە ٤. باوەشێنی کارەبایی ⊑ ١. نیرنگ ٢. نوع ٣. لِم؛ فنّ ٤. فَن

**فەنا¹ / fena/**: ناو. پەنا؛ پەسیو؛ دالدە؛ ئەنوا ⊑ پناه

⊡ **فەنای بێدەنگ**: فەنابێدەنگ؛ قرقاپ؛ گەمەیەکە ئەشێ بە کۆمەڵ دەم بگرن و قسە نەکەن ⊑ پانتومیم

**فەنا²**: ئاوەڵناو. ١. فەوتاو؛ توونا؛ لە بەین چووگ ‹لەم گرانییەدا فەنا بووین!› ٢. خەڵوەت ‹شوێنێکی فەنای بێدەنگە› ⊑ ١. نابود ٢. دِنج

**فەنا³**: ئامراز. چون؛ ئاسا؛ وەک ⊑ همانندِ

**فەنابێدەنگ / fenabêdeng/**: ☜ فەنای بێدەنگ

**فەنباز / fenbaz/**: ئاوەڵناو. فەنواز: ١. فێڵەباز ٢. زریگ؛ زیرەک ⊑ ١. حیله‌گر ٢. زرنگ

**فەنتازی / fentazî/**: ☜ فانتێزی

**فەنتازیا / fentazya/**: ☜ فانتێزی

**فەند / fend/**: ناو. ١. حیلە؛ فێڵ؛ فەن ٢. شەم؛ مۆم ⊑ ١. نیرنگ ٢. شمع

**فەندوفێڵ / fend û fêł/**: ☜ فەن‌وفێڵ

**فەندەک / fendek/**: ناو. فەنەک؛ چەرخ؛ چەخماخ؛ ئامرازی ئاگر هەڵکردن ⊑ فندک

**فەندەڵ / fendeł/**: ناو. فێڵ؛ تەڵەکە ⊑ حیله

**فەندەڵفێڵ /fendełfêł/**: ناو. فێڵ و تەڵەکە ‹لە ڕێگە زۆر بە دلپڕی گوتم: چوونەکەت کارێکی زۆر خراپ بوو؛ هەزاران جار ئەو دەوڵەتانە بەو فەندەڵفێڵ و سوێندانە کوردیان لە بەین بردوون «هەژار، چێشتی مجێور»› ⊑ حیله و نیرنگ

**فەنکوەیل / fenk(i)weyl/**: ناو. دەزگای باگۆڕ، بریتی لە باوەشێن و کلافێ لوولەی ئاوی سارد یان گەرم کە با بە نێو کلافەکەدا دەگەڕێ و سارد یان گەرم دەبێتەوە ⊑ فن‌کوئیل

**فەننا / fenna/**: ئامراز. وەکی؛ وەک؛ لە گوێن؛ لە چەشنی ⊑ مانندِ؛ همانندِ

**فەنواز / fenwaz/**: ☜ فەنباز

**فەنوفون / fen û fûn/**: ناو. فێڵ و تەڵەکە ⊑ حیله و نیرنگ

**فەن‌وفێڵ / fen û fêł/**: ناو. فەندوفێڵ: ١. حیلەوحەواڵە ٢. وردەکاری پێویست بۆ ئەنجام دانی کارێک ⊑ ١. نیرنگ ٢. فوت‌وفن

**فەنەر / fener/**: ناو. ١. فانۆز؛ لەنتەری؛ چرادەستی ٢. فەنەرە؛ کەڤان؛ لیژە؛ کەرەستەیەکی کێشسان کە پاش نەمانی هێزی دەرەکی، دەگەڕێتەوە سەر خۆی، بەتایبەت لەتە کانزایێ کە بە هۆی بادران و مووچانەوە وای لێ هاتبێ ⊑ ١. فانوس ٢. فنر

**فەنەرە / fenere/**: ☜ فەنەر ـ٢

**فەنەری / fenerî/**: ئاوەڵناو. ١. فەنەردار ٢. وەک فەنەر ⊑ ١. فنردار ٢. فنرسان

**فەنەک¹ / fenek/**: ناو. ١. حەنەک؛ گاڵتە؛ قسەی پێکەنین ٢. ☜ فەندەك ⊑ ١. شوخی ٢. ☜ فندك

**فەنەک²**: ئاوەڵناو. ١. فێڵباز؛ حیلەباز ٢. گاڵتەچی؛ حەنەکچی ⊑ ١. نیرنگباز ٢. لوده

**فەنەکباز / fenekbaz/**: ئاوەڵناو. فێڵکار؛ حیلەساز ⊑ مکّار

**فەوت** / fewt/: ناو. ١. چۆنیەتی نەمان؛ فەوتان ٢. مەرگ؛ چۆنیتی مردن؛ ساردەوە بوون 🇮🇷 ١. فوت ٢. مرگ

▣ **فەوت کردن**: مردن 🇮🇷 فوت کردن

**فەوتان** / fewtan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //فەوتای؛ دەفەوتێ؛ بفەوتێ// ١. نەمان؛ لە دەس چوون ‹بە حەسرەت عومری من یەکبارە فەوتا/ مەگەر عومرێ دووبارەم پێ عەتا کەی «نالی»› ٢. چوون؛ بە سەر چوون ‹نوێژەکەم فەوتا› ٣. *[کینایە]* مردن؛ گیان دەرچوون ‹گوتی: ئەگەر قازی نەفەوتابا ئێمە هەموومان دەفەوتاین «هەژار، چێشتی مجێور»› 🇮🇷 ١. از دست رفتن ٢. قضا شدن ٣. مُردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: فەوتاو/ چاوگی نەرێنی: نەفەوتان

**فەوتاندن** / fewtandin/: چاوگ. تێپەڕ. //فەوتاندت؛ دەفەوتێنی؛ بفەوتێنە// لە دەست دان؛ نەهێشتن 🇮🇷 بە باد دادن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەفەوتاندن

**فەوتاو** / fewtaw/: ئاوەڵناو. لە نێو چوو 🇮🇷 تلف شده

**فەوتنای** / fewtnay/: چاوگ. فەوتاندن 🇮🇷 بە باد دادن

**فەوتیای** / fewt(i)yay/: چاوگ. ١. فەوتان ٢. مردن؛ کۆچی دوایی کردن 🇮🇷 ١. از دست رفتن ٢. فوت کردن

**فەوتێفەر** / fewtêfer/: ئاوەڵناو. کۆژەر؛ وێرانکەر 🇮🇷 ویرانگر

**فەوج** / fewc/: ناو. ١. کۆمەڵێکی زۆر لە مرۆ ‹فەوجێ ژن هاتن و بێرەدا تێپەڕین› ٢. هێز؛ بەشێ لە لەشکر کە لە هەزار کەس کەمتر نەبێ ‹فەوجێک لەشکری عوسمانی، بۆ شەڕی رووسان، هاتنە کوردستان› 🇮🇷 ١. گروهی از مردم ٢. هنگ

**فەورەن** / fewren/: ئاوەڵکار. فەوری؛ دەسبەجێ؛ لەجێ؛ بێ وە درەنگ خستن ‹فەورەن هات› 🇮🇷 فوراً

**فەوری**[1] / fewrî/: ئاوەڵناو. بە پەلە؛ بێ‌ماتڵی ‹کاری فەوری› 🇮🇷 فوری

**فەوری**[2]: ☜ فەورەن

**فەوقلیسانس** / fewq lîsans/: ناو. ماستەر؛ ماجیستەر 🇮🇷 فوق لیسانس؛ کارشناسی ارشد

**فەوکاندن** / fewkandin/: چاوگ. فەوتاندن؛ لە ناو بردن 🇮🇷 بر باد دادن

**فەهم** / fehm/: ☜ فام

**فەهمکۆر** / fehmkor/: ئاوەڵناو. نازیرەک؛ دەبەنگ 🇮🇷 بی‌ذکاوت

**فەهۆ** / feho/: ☜ فەدۆک

**فەهیتۆ** / fehîto/: ☜ فەدۆک

**فەهێت** / fehêt/: ناو. فەهێد؛ فهێت؛ فەدی 🇮🇷 شرم؛ آزرم

**فەهێد** / fehêd/: ☜ فەهێت

**فەیتوون** / feytûn/: ☜ فایتوون

**فەیدا** / feyda/: ☜ فایدە

**فەیدە** / feyde/: ☜ فایدە

**فەیز** / feyz/: ناو. ئابڕوو؛ حەیا 🇮🇷 آبرو

▣ **فەیز چوون**: حەیا چوون؛ ئابڕوو چوون ‹بەو خەیانەتە، بە جارێ فەیزمان چوو!› 🇮🇷 رسوا شدن

**فەیلەسووف** / feylesûf/: ناو. پیتۆڵ: ١. ئەوی بناغەی فەلسەفەیەکی داناوە ٢. ئەوەی لە فەلسەفە باش تێدەگا و راڤەی دەکا 🇮🇷 ١و٢. فیلسوف

**فهێت** / fihêt/: ☜ فەهێت

**فهێتکار** / fihêtkar/: ☜ فەدیکار

**فهێدکار** / fihêdkar/: ☜ فەدیکار

**فیالە** / f(i)yale/: ناو. گیایەکە دەیکەنە ماستەوە بۆنی خۆشە 🇮🇷 گیاهی مُعطر

**فیبر** / fibr/: ناو. ١. تەختەی ناسکی دروستکراو لە وردە چێو و چەسپ ٢. ریش؛ ریشان؛ ریشاڵ؛

ڕیس؛ هەموو جۆرە ڕیشاڵەیەک کە لە پیشەسازی، بەتایبەت هەوداچنیدا بە کار دەچێ ≡ ١و٢. فیبر

▣ **فیبری نووری:** ڕیشاڵی ناسک و ڕۆشنی شیشە یان پەلاستیک کە نووریان لێوە تێپەڕ دەبێ، لە ئامرازی بژیشکی، بۆ دیتنی ناوەوەی لەش و هەروەها کەرەستەی تەلەفوون و تەلەگراف، کەڵکی لێ وەردەگرن ≡ فیبر نوری

**فیت¹ / fit/:** ناو. ١. پیت؛ بەرەکەت ٢. سووچ؛ تاوان ≡ ١. برکت ٢. گُناه

**فیت²:** ئاوەڵناو. ڕێک ئەندازە؛ پڕاوپڕ ‹کەوشەکان فیت پامە› ≡ اندازه؛ مُناسب

**فیت³:** دەنگەناو. ١. فیتوو؛ دەنگ لە ناو دوو لێو ٢. فت لە سەبیلە ≡ ١. سوت ٢. فوت یا پُک به چپق

**فیتفیتە / fitfite/:** ناو. فیزۆک: ١. فیکە؛ پیپیک؛ ئامرازی فیتوو لێدان ‹ژنێکی دەرەجەدار، تەنگەستوور، دەم و چاو هەڵپڕاو، فیت‌فیتە بە قەدەوە هاتە ژووریّ «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. تیف‌تیفە؛ تیوتیوە؛ کاری ساف و لووس کردنی سەر و ڕیش ≡ ١. سوت ٢. دوتیغه

**فیتک / fitik/:** ناو. فیکە؛ فیت‌فیتە؛ فیتوو؛ فیتەک؛ پیپیک؛ ئامرازی فیت لێ دان ≡ سوت

**فیتکەدوور / fitkedûr/:** ئاوەڵناو. دەسکەبلیند؛ دەسەدرێژ ‹تا سەبیلی زەرد و سووری فیتکەدووری خۆم بێ/ فلتەفلتی نێرگەلە و تۆپی سیغارم بۆ چییە؟ «قانع»› ≡ دستەبلند

**فیتگ / fitig/:** ناو. پلتۆک؛ پیتکە؛ پەلەپیتکە؛ کاری بە قامک لە شتێک دان ≡ تلنگُر

**فیتنە / fitne/:** ☜ فتنە

**فیتوو / fitû/:** ناو. ☜ فیتک

**فیتە / fite/:** ناو. ١. فیت؛ فیتوو؛ فیکە ٢. *[کینایە]* بەرهەڵدای خوێڕی ≡ ١. سوت ٢. ولگرد

▣ **فیتە لێدان:** فیکە کێشان؛ فیتوو تووڕاندن ≡ سوت زدن

**فیتەر / fiter/:** ئاوەڵناو. زەبەلاحی تەژە ≡ گُندەبک

**فیتەفیت / fitefit/:** ☜ فیقەفیق

**فیتەک / fitek/:** ☜ فیتک

**فیج / fic/:** ئاوەڵناو. ١. کۆڵۆس؛ تایبەتمەندی کەسێ کە ددانی پێشەوەی کەوتوون ٢. خوار؛ خێچ ≡ ١. دندان پیش اُفتاده ٢. کج

**فیجقە / ficqe/:** ☜ فیچقە

**فیچ¹ / fiç/:** ☜ پێچ¹

**فیچ²:** ئاوەڵناو. خێل؛ خوێل ≡ لوچ

**فیچان / fiçan/:** چاوگ. پێچان؛ باو خواردن ≡ پیچیدن

**فیچاندنەوە / fiçand(i)newe/:** چاوگ. داهێنانەوە؛ قەمچاندنەوە ≡ پیچاندن

**فیچانەوە / fiçanewe/:** چاوگ. ١. داهاتنەوە؛ قەمچ خواردنەوە ٢. نەرم بوونەوە؛ پووچانەوەی شتی ڕەق ‹جاران ئەو هەمووە قەڵەو و جوان بوو، ئێستا فیچاوەتەوە› ≡ ١. پیچیدن ٢. پوکیدن

**فیچقە / fiçqe/:** ناو. فیسکە؛ فیجقە: ١. دۆخی دەرچوونی تراو بە تەوژم لە شتێکەوە ٢. فیشکە؛ کفارە؛ فوارە ٣. گیای مۆسک ≡ ١. فوران ٢. فواره ٣. گیاه ساقه کاوک

▣ **فیچقە بەستن:** ☜ فیچقە کردن

**فیچقە کردن:** فیچقە بەستن؛ فیسکە بەستن؛ فیسکە کردن؛ دەرپەڕینی تراو بە تەوژم ‹دەیکا بە خەڵووز دڵ و هەناوان/ خوێن فیچقە دەکا لە دڵ، لە چاوان «هەژار، *مەموزین*»› ≡ فوران کردن

**فیچقەکردوو / fiçqekirdû/:** ئاوەڵناو. جۆشیو؛ فیشقەکردوو ≡ فَوَران‌کرده

**فیچەڵفاچ / fiçelfaç/:** ئاوەڵناو. قیلەوقاچ؛ شەفتوور ≡ مورب

**فیدا / fida/:** ناو. قوربان؛ سەرگەرد؛ گۆڕی؛ ساقە؛ خڕ؛ کار و ڕەوتی لە پێناو کەس یان شتێکدا تێدا چوون ≡ فدا

⊡ **فیدا بوون** قوربان بوون؛ لە پێناو کەس یان شتێکدا تێدا چوون ‹نەخۆشی چاوەکەت خوێنی وەفایی بۆتە دەرمانی/ فیدات بم! زیز مەبە، ها بمکوژە، دەردت بە گیانی من! «وەفایی»›.

هەروەها: **فیدا کردن** ⇐ فدا شدن

**فیدارتیو / fid(i)ratîw/:** ☜ **فیدراڵ**

**فیداکار / fîdakar/:** ئاوەڵناو. خۆ بەختکەر؛ گیان لە سەر دەست ⇐ فداکار

**فیداکارانە / fîdakarane/:** ئاوەڵکار. بە شێوەی فیداکاران ‹شەو هەموو شەو چاوەڕێیە ڕۆژ هەڵێ، هەر ڕۆژ هەڵات/ مەحوە سەرتاپا لە بەرپێیا فیداکارانە شەو «مەحوی»› ⇐ فداکارانه

**فیداکاری / fîdakarî/:** ناو. گیانبەخشی؛ کار و ڕەوتی بەخت کردنی شتی بەنرخ (وەک ماڵ و گیان) لە پێناو کەس یان شتێکدا ‹فیداکاری لە پێناوی نیشتماندا› ⇐ فداکاری

**فیدایی / fîdayî/:** ناو. فدایی؛ هژمە؛ گیانفیدا؛ گۆری و قوربان ⇐ فدایی

**فیدراسیون / fîdrasyun/:** ناو. ڕێخراوەیێ کە لە چەن ڕێخراوەی بچووکتر پێکهاتووە ‹فیدراسیونی نێونەتەوەیی کار› ⇐ فدراسیون

**فیدراڵ / fid(i)rał/:** ئاوەڵناو. فیدارتیو؛ فیدراڵی: ١. پێکهاتوو لە چەن دەوڵەتی سەربەخۆی ئەیالەتی و دەوڵەتێکی ناوەندی کە هەڵبژاردەی خەڵکی هەموو ئەیالەتەکانە ٢. سەر بە دەوڵەتی فیدراڵ ‹پولیسی فیدراڵ› ⇐ ١و٢. فدرال

**فیدراڵی / fîd(i)rałî/:** ☜ **فیدراڵ**

**فیدیە / fîdye/:** ناو. فدیە؛ دارایی و ماڵێ کە بۆ ئازادی کەسێک دەدرێ ⇐ فدیه

**فیراق / fîraq/:** ناو. جودایی؛ دووری ⇐ فراق

**فیرعەون / fir'ewn/:** ناو. ١. فرعەون؛ ناوی پاشایانی میسری کەونارا ٢. *[کنایە]* دەسەڵاتداری زاڵم ⇐ ١. فرعون ٢. حاکم ظالم

**فیرکان / fîrkan/:** ☜ **فیڕان**

**فیرکاندن / fîrkandin/:** ☜ **فیڕاندن**

**فیڕ / fîř/:** ناو. پیسایی تەڕ و تراو ⇐ مدفوع اسهالی

**فیڕان / fîřan/:** چاوگ. فیڕکان؛ فیرکان ⇐ اسهالی گرفتن

**فیڕاندن / fîřandin/:** چاوگ. تێپەڕ. //فیڕاندت؛ دەفیڕێنی؛ بفیڕێنە// فیڕانن؛ فیرکاندن؛ پیسایی شل کردن ⇐ اسهالی ریدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەفیڕاندن

**فیڕانن / fîřanin/:** ☜ **فیڕاندن**

**فیڕکان / fîřkan/:** ☜ **فیڕان**

**فیڕکن / fîřkin/:** ☜ **فیڕن**

**فیڕکە / fîřke/:** ناو. گووشلەی حەیوان ⇐ اسهال حیوان

**فیڕکەر / fîřker/:** ناو. حەیوانێ بەلەفیڕەی گرتبێ ⇐ حیوان اسهال

**فیڕن / fîřin/:** ئاوەڵناو. فیڕکن: ١. تووشیاری زگەشۆرەی (ئاژەڵ) ٢. *[کنایە]* لاواز؛ چەپەڵ و چەپلاغ ⇐ ١. اسهال (حیوان) ٢. لاغرمُردنی

**فیڕنەگوڵە / fîřnegule/:** ☜ **فیسقە ـ١**

**فیڕۆ / fîřo/:** ئاوەڵناو. فیڕوو؛ بە هیچێ چوو؛ خۆڕایی لە دەس چوو ⇐ هدر

⊡ **بە فیڕۆ چوون** لە کیس چوون؛ بە خۆڕایی لە دەس چوون ‹گەلێ ڕەنجم لەڕێگەی خۆشەویستیدا بە فیڕۆ چوو/ لە دەوری ئاگری دووریت کرووزام چەشنی پەروانە «قانع»› ⇐ هدر رفتن

**بە فیڕۆ دان** فەوتاندن؛ لە کیس دان ⇐ هدر دادن

**فیڕە[1] / fîře/:** ناو. فیش؛ دۆخی زگچوونی ئاژەڵ ⇐ اسهال حیوان

**فیڕە[2]:** دەنگەناو. فیش؛ دەنگی ڕیانی تراوی ئاژەڵ ⇐ صدای ریدن اسهالی

**فیز / fîz/:** ناو. ١. فیس؛ بادیهەوایی؛ دەعیە ‹ئەمرۆ

که به فیز و قۆزی، سۆزی تۆزی/ بابردەڵە! پێت وا بوو جیهان بۆ تۆیە؟! «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*» ٢. فیتە؛ فیقە؛ فیکە ☰ ١. تکبر؛ فخر ٢. سوت

⊡ **فیز کردن:** دەعیە فرۆشتن؛ خۆ گەورە و باش نیشان دان ☰ فخر فروختن

**فیز لێ دان:** فیز کردن؛ فەخر فرۆشتن ‹فیزمان بە سەرا لێ مەدە مەستی ناکەی!/ هەر کارێ دەکەی هەزار کەڕەت خۆزگە بە مەی! «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ☰ فخر فروختن

**فیز نەهێنان:** پێ عەیب بوون ‹فیزی ناهێنێ، باوکی بدوێنێ «مەسەل»› ☰ عار داشتن

**فیزار** / fîzar/: ناو. هاوار لە خەڵک بۆ یاری دان ☰ طلب کمک از مردم

**فیزان** / fîzan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //فیزای؛ دەفیزێ؛ بفیزێ// خوار بوون لە بێهێزی ‹خەڵفی شۆڕەبی و مەندۆک و بیزا/ لەبەر ئەو باڵابەرزە دەفیزا «هێمن»› ☰ خم شدن از ضعف

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: فیزاو/ چاوگی نەرێنی: نەفیزان

**فیزاو** / fîzaw/: ئاوەڵناو. خواربوو لە بێهێزی ☰ خم‌شده از بی‌رمقی

**فیزفیز** / fîzfîz/: ناو. باگرۆ؛ باهۆز؛ باگژە؛ گژەبا ☰ تُندباد

**فیزفیزۆک** / fîzfîzok/: ناو. فیتفیتە؛ ماسوولە ☰ سوت

**فیزماڵک** / fîzmałk/: ↓

⊡ **فیزماڵک دان:** فیسماڵک دان؛ باریکەو بوون؛ خۆ دزینەوە؛ بێدەنگ لە شوێنێ دەرباز بوون ‹لە ناو مقۆمقۆی هاتوچۆکەراندا فیزماڵکم دایە و خانووەکەم گۆڕی و خۆم دزییەوە! «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ جیم شدن

**فیزن** / fîzin/: ئاوەڵناو. فیسن؛ بادیهەوا؛ بەدەعیە ☰ فخرفروش

**فیزۆک** / fîzok/: ☜ **فیتفیتە**

**فیزە** / fîze/: دەنگەناو. ویزە: ١. فیقەی لووت؛ دەنگی باریک لە بێڤلەوە ٢. دەنگی باریک لە درزی بابوێرەوە ☰ ١. سوت بینی ٢. زوزەی باد

**فیزەرە** / fîzere/: ☜ **خیزەرە**

**فیزەفیز** / fîzefîz/: دەنگەناو. فیزەی زۆر و لە پەستا ☰ سوت و زوزەی پیاپی

**فیزیا** / fîzya/: ☜ **فیزیک**

**فیزیایی** / fîzyayî/: ☜ **فیزیکی**

**فیزیک** / fîzîk/: ناو. فیزیا: ١. زانستی ماک و وزە و لێک‌کردیان لە بواری میکانیک، دەنگ، تیشک، گەرما، میگناتیس، کارەبا، تاو، پێکهاتەی ئەتوم و دیاردەی ناوەکەییەوە ٢. کار و ڕەوت و دیاردەگەلی ئاسایی دەزگا یان تەنێک ☰ ١و٢. فیزیک

**فیزیکی** / fîzîkî/: ئاوەڵناو. فیزیایی: ١. سەر بە فیزیک ‹تاقی کردنەوەی فیزیکی› ٢. سروشتی ‹دنیای فیزیکی› ٣. جەستەیی؛ لەشی ‹کاری فیزیکی› ☰ ١تا٣. فیزیکی

**فیزین** / fîzîn/: ☜ **فیشین**

**فیزیۆترا پی** / fîzyot(i)rapî/: ناو. کاری دەرمانی نەخۆشی، لاوازی یان کەمایەسی جەستە لە ڕێگەی بزواندن و جووڵاندنی فیزیکی (وەک: شێلان، ژیمناستیک و ...) و بە یارمەتی کەرەستەی تایبەتەوە ☰ فیزیوتراپی

**فیزیۆترا پیست** / fîzyot(i)rapîst/: ناو. کەسێ کە بە شێوەی فیزیۆتراپی نەخۆش دەرمان دەکا ☰ فیزیوتراپیست

**فیزیۆلۆجی** / fîzyołocî/: ناو. کارئەندامناسی؛ زانستی ناسینی کاری ئەندام و کۆئەندامەکانی لەش ☰ فیزیولوژی

**فیس**[1] / fîs/: ناو. ١. فیز؛ بادیهەوایی. هەروەها: **فیس کردن** ٢. قوپاوی؛ ڕۆچوویی ☰ ١. تکبُر ٢. فرورفتگی

**فیس**[2]: ئاوەڵناو. تەڕ؛ نمدار؛ شەدار ☰ خیس

**فیسا / fisa/**: ئاوەڵناو. لەخۆبایی؛ بادیهەوا ☰ مُتکبر

**فیسار / fisar/**: جێناو. فیسارە؛ فیستار؛ کەس یان شتی نەناسراوی دوایی ‹فلان و فیسار› ☰ بیسار

**فیسارە / fisare/**: ☜ **فیسار**

**فیسارەکەس / fisarekes/**: جێناو. فیستارەکەس؛ کەسی نەناسراوی دوایی ‹فلانکەس هات و فیسارەکەس چوو› ☰ بیسارکس

**فیسان / fisan/**: چاوگ. فیسیان؛ خووسان ☰ خیسیدن

**فیساندن / fisandin/**: چاوگ. فیسانن؛ خووساندن ‹پاقلە لە ئاوا فیساندن› ☰ خیساندن

**فیسانن / fisanin/**: ☜ **فیساندن**

**فیساو / fisaw/**: ئاوەڵناو. فیسیاگ؛ خووساو ☰ خیسیده

**فیستار / fistar/**: ☜ **فیسار**

**فیستارەکەس / fistarekes/**: ☜ **فیسارەکەس**

**فیستان / fistan/**: ناو. دێرە؛ جۆرێک جلکی ژنانەیە لە پارچەی ڕەنگاوڕەنگی دەدروون ☰ نوعی لباس زنانە

**فیستۆل / fistol/**: ☜ **فیستول**

**فیستول / fistûl/**: ناو. ناسۆر؛ فیستۆل؛ گەیشتنەوە یەکی ناسروشتی دوو هێڵۆلی ناوەکی لەش یان دەم کردنەوەی شوێنێکی وا لە لەشدا ☰ فیستول

**فیسقلی / fisq(i)lî/**: ئاوەڵناو. [بەلار] فیسقەلی؛ تسقەلی؛ زۆر پچووک ☰ فسقلی

**فیسقە / fisqe/**: ناو. ۱. فڕنەگولە؛ فندەگولە؛ فیڕنەگولە؛ فیسقەگولە؛ چۆلەکەمشکە؛ کەڵەفندە؛ تۆرەمە باڵندەیەکی بچووکن، بە درێژایی ۹ سانتیمیتر، بە پەڕ و باڵی ڕێ ـ ڕێ قاوەیی و کلکی کورت و قیتەوە کە وەک مشک بە ناو گەلا و بەرگی گیا و دارانا دەگەڕێن ۲. بەرگایلکە؛ کلکهەڵتەکێنە ۳. خسکە؛ پیوازی زۆر ورد کە لە باتی تۆم ئەیچێنن ٤. ☜ **فیچقە** ☰ ۱. الیکائی ۲. دمجنبانک ۳. پیاز ریز کاشتنی ۴. ☜ **فیچقە**

☐ **فیسقە بەستن**: ☜ **فیچقە کردن**

**فیسقە کردن**: ☜ **فیچقە کردن**

**فیسقەگولە / fisqegule/**: ☜ **فیسقە ـ۱**

**فیسقەلی / fisqelî/**: ☜ **فیسقلی**

**فیسقەڵ / fisqeł/**: ئاوەڵناو. [بەلار] جووکی؛ ترسەنۆکێ کە لە شەڕدا تەنیا هەرا ـ هەرا دەکا و دەنەڕێنێ ☰ ترسوی پرسر و صدا

**فیسکانی / fiskanî/**: ئاوەڵناو. زۆر وردیلە ☰ بسیار ریز

**فیسکو / fiskû/**: ئاوەڵناو. [شوورەیی] نێربازە؛ بەچەباز (بۆ پیاو) ☰ بچەباز

**فیسکە / fiske/**: ناو. پەلەپیتکە؛ پەڵ لە ناو دووسەری پەنجەڕا هاویشتن ☰ سنگریزە انداختن با تلنگر

**فیسکی / fiskî/**: ئاوەڵناو. [شوورەیی] بڤکێ؛ خراپە؛ خۆفرۆش ☰ هرجایی

**فیسماڵک / fismałik/**: ↓

☐ **فیسماڵک دان**: ☜ **فیزماڵك دان**

**فیسن / fisin/**: ☜ **فیزن**

**فیسنای / fisnay/**: چاوگ. خووساندن ☰ خیساندن

**فیسە / fise/**: ناو. ۱. بادیهەوایی؛ لووتبەرزی؛ فیز ۲. زینا؛ سێکسی حەرامە ☰ ۱. تکبر ۲. زِنا

**فیسەکی / fisekî/**: ناو. [شوورەیی] قەحبە؛ ژنی خراپە ☰ فاحشه

**فیسەڵ / fiseł/**: ئاوەڵناو. بۆش؛ با لێ دەرچووگ ☰ باد دررفته

**فیسەنە / fisene/**: چاوگ. خووساندن ☰ خیس کردن

**فیسیاگ / fisyag/**: ☜ **فیساو**

**فیسیان / fisyan/**: ☜ **فیسان**

**فیسیای / fisyay/**: چاوگ. فیسان؛ خووسان ☰ خیسیدن

**فیش¹** / fîş/: ناو. ١. ☜ **فیرە** ٢. دڤانەک؛ لاپەڕەی چاپی ٣. میلەیەکی کانزایی لکاو بە چەن تاڵ سیمەوە بۆ پێوەندی دانی دوو خولگەی کارەبایی پێکەوە ٤. لاپەڕە؛ بەرگە؛ پارچە کاغەز یا مقەبای بۆ لە سەر نووسین ☰ ١. ☜ **فیرە ٢تا٤.** فیش

**فیش²**: ئاوەڵناو. زۆر؛ فریە؛ فرە؛ زیاد؛ زەحف؛ زاف ☰ بیش

**فیشاردە** / fîşarde/: ناو. لەغەز؛ مەتەڵ؛ مەتەڵۆکە؛ تشتانۆک ☰ چیستان

**فیشاڵ** / fîşał/: ناو. درۆ؛ فڕ؛ بافیش ‹مەوێستە! خۆت مەگنخێنە! مەترسە!/ لە فیشاڵ و لە بوختان و لە دەمگۆ «هێمن»› ☰ لاف‌وگزاف

**فیشاڵباز** / fîşałbaz/: ئاوەڵناو. فیشاڵچی؛ فیشاڵکەر؛ درۆهەڵبەست؛ خۆهەڵکێش ☰ لافزن

**فیشاڵچی** / fîşałçî/: ☜ **فیشاڵباز**

**فیشاڵکەر** / fîşałker/: ☜ **فیشاڵباز**

**فیشاندن** / fîşandin/: چاوگ. تێپەڕ. //فیشاندت؛ دەفیشێنی؛ بفیشێنە// فیشانن: ١. فیڕاندن ٢. پرژاندن؛ پژاندن ☰ ١. ریدن اسهالی ٢. پاشیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەفیشاندن

**فیشانن** / fîşanin/: ☜ **فیشاندن**

**فیشتر** / fîştir/: ئاوەڵکار. هنافیشی؛ هەر پتر ☰ بیشتر

**فیشتەر** / fîşter/: ئاوەڵناو. زیاتر؛ پتر؛ بێتر ☰ بیشتر

**فیشقان** / fîşqan/: ☜ **پیشقان**

**فیشقاندن** / fîşqandin/: ☜ **فیشکاندن**

**فیشقنای** / fîşqnay/: ☜ **فیشکاندن**

**فیشقوهۆڕ** / fîşq û hoř/: دەنگەناو. دەنگی پێکەنین و پرمەی چەند کەس پێکەوە ☰ صدای خندیدن عدەای با هم

**فیشقە¹** / fîşqe/: ناو. شرینقە؛ سرینگ؛ ئابدۆزەک ☰ سُرنگ

**فیشقە²**: دەنگەناو. فیشکە؛ فیشکەفیشک: ١. دەنگی هاتنە دەری شتی وەک ئاو و خوێن و هەڵم لە کونێکەوە ٢. جۆرێ دەنگی جانەوەر کە دێ دەرپەڕێ ٣. دەنگی کەڵ و گامێش و بەراز ☰ ١. فش؛ صدای فوران آب ٢. صدایی شبیه جیغ از برخی حیوانات ٣. صدای گاومیش و گُراز

**فیشقی** / fîşqî/: ئاوەڵناو. دڵناسک؛ تایبەتمەندی کەسێ کە زوو عاجز دەبێ ☰ زودرنج

**فیشکان¹** / fîşkan/: چاوگ. فیشقە کردنی حەیوان ☰ جیغ کشیدن حیوان

**فیشکان²**: ناو. پیشکان؛ ئامرازی گیا هەڵکەندن ☰ بیلک گیاه کندن

**فیشکاندن** / fîşkandin/: چاوگ. فیشقاندن؛ فیشقنای؛ دەنگ دەرهێنانی حەیوان لە کاتی دەرپەڕینا ☰ جیغ کشیدن حیوان هنگام فرار

**فیشکنای** / fîşknay/: ☜ **فیشکاندن**

**فیشکە** / fîşke/: ☜ **فیشقە²**

**فیشکەفیشک** / fîşkefîşk/: ☜ **فیشقە²**

**فیشە** / fîşe/: دەنگەناو. دەنگی با کە لە جێگەی تەنگەوە دەرچێ ☰ صدای زوزەی باد

**فیشەک** / fîşek/: ناو. فشەک؛ قاڵک؛ لوولەیەکی گچکە، داگری بارووت و گوللە و تەریقە ☰ فشنگ

**فیشەکباران** / fîşekbaran/: ☜ **گوللەباران**

**فیشەکبەند** / fîşekbend/: ☜ **فیشەکدان**

**فیشەکدان** / fîşekdan/: ناو. فیشەکبەند؛ فیشەکلغ؛ فیشەکلۆخ؛ ڕەخت؛ ڕەختەفیشەک ☰ تیردان

**فیشەکفڕێدەر** / fîşekf(i)řêder/: ناو. ئامرازێکە لە تفەنگدا ☰ پوکەپران

**فیشەککێش** / fîşekkêş/: ناو. فشەککێش؛ کۆلاس ☰ گلنگدن

**فیشەکگر** / fîşekgir/: ناو. ئامرازێکە لە تفەنگدا ☰ فشنگ‌کش

**فیشەکلغ / fîşekliğ/**: ناو. ١. ☜ **فیشەکدان** ٢. زنجیرە فیشەک کە ڕاست و چەپ لە شانی دەکەن ☰ ١. ☜ **فیشەکدان** ٢. نوار فشنگ

**فیشەکلۆخ / fîşeklox/**: ☜ **فیشەکدان**

**فیشەکەشێتە / fîşekeşête/**: ناو. فشفشە؛ تۆقتۆقە؛ هاژەک؛ وژەک؛ مەشەک؛ باڕووتی لە قاقەزەوە پێچراو کە منال بۆ گەمە یان لە جێژنان دەیتەقێنن ☰ فشفشە

**فیشین / fîşîn/**: چاوگ. فشین؛ فیزین؛ هاشاندنی مار ☰ صدا درآوردن مار

**فیفکە / fîfke/**: ناو. فیتفیتە؛ فیقەنە ☰ سوت

**فیفی / fîfî/**: ئاوەلناو. بافیش؛ هاشە ‹هەرچی هاوارێ ئەکەی، لای بێتەمیز هەر فیفییە/ باوەڕت بێ ئەی وەتەن! لافم لە ئەشعارا نییە «قانع»› ☰ لاف

**فیڤرییە / fîvrîye/**: ناو. فیورییە؛ فێڤرییە؛ شوبات؛ دووهەمین مانگی زایینی کە ٢٨ ڕۆژە (لە سالی کەبیسەدا ٢٩ ڕۆژ) و لە دوازدەی ڕێبەندانەوە دەسپێدەکا ☰ فوریە

**فیق[١] / fîq/**: ناو. ١. جیقنە؛ ڕیقنە ٢. فیتە؛ فیقە ☰ ١. پیخال؛ مدفوع پرندە ٢. سوت

**فیق[٢]**: دەنگ. جیق؛ دەنگی ناویستەکی لە کەوتنە ژێر گوشارەوە ☰ صدای ناشی از زیر فشار قرار گرفتن

**فیقاندن / fîqandin/**: چاوگ. فیقانن: ١. جیقنە کردن ٢. فیتوو لێدان ☰ ١. پیغال انداختن مُرغ ٢. سوت زدن

**فیقانن / fîqanin/**: ☜ **فیقاندن**

**فیقفیقە / fîqfîqe/**: ناو. فیتفیتە ☰ سوت؛ ابزار سوت زدن

**فیقن / fîqin/**: ☜ **فیقنە[٢]**

**فیقنای / fîqnay/**: ☜ **فیکنای**

**فیقنە[١] / fîqne/**: ناو. فیتفیتە؛ ئامرازی فیتوو پێ لێ دان ☰ سوت

**فیقنە[٢]**: ئاوەلناو. [پلار] فیقن؛ مردەملاس؛ دالگۆشت ☰ لاغرمردنی

**فیقە / fîqe/**: ناو. ١. جیقە؛ ڕیقنە ٢. فیتە؛ فیقە ☰ ١. پیغال ٢. سوت

**فیقەفیق / fîqefîq/**: دەنگەناو. فیتەفیت؛ فیتەی لەسەر یەک ☰ صدای پیاپی سوت

**فیقەنە / fîqene/**: ناو. ١. فیتفیتە؛ ئامرازی فیتە لێ دان ٢. پیکی زوڕنا ☰ ١. سوت ٢. زبانەی سُرنا

**فیقی / fîqî/**: ☜ **فێقی**

**فیک / fîk/**: ناو. ١. فێڵ؛ گزی؛ کەلەک ٢. سووچ؛ تاوان ٣. فیتوو؛ فیکە ☰ ١. حیلە ٢. گناە ٣. سوت

**فیکالەکونێ / fîkalekunê/**: ناو. چاوشارەکێ ☰ قایمموشک

**فیکاندن / fîkandin/**: چاوگ. فیکانن؛ فیکە کێشان؛ فیکین؛ فیتوو لێدان ☰ سوت زدن

**فیکانن / fîkanin/**: ☜ **فیکاندن**

**فیکفیکە / fîkefîke/**: ناو. پیقنە؛ فیقە ☰ سوتک

**فیکنای / fîknay/**: چاوگ. فیقنای؛ فیکە کردن ☰ سوت زدن

**فیکە / fîke/**: ناو. فیتە ☰ سوت

▣ **فیکە کێشان**: ☜ **فیکاندن**

**فیکەی سمێڵ هاتن**: *[کینایە]* زۆر کەیفساز بوون ‹کاری باشە و زگی تێرە، هەر فیکەی سمێلی دێ› ☰ بسیار خوشحال بودن

**فیکەفیک / fîkefîk/**: ناو. فیتەفیت ☰ سوت پیاپی

**فیکەکونێ / fîkekunê/**: ناو. فیکەواکونا؛ فیکەوەکونێ؛ وشەیەکە لە هێندێ کایەی منالاندا ☰ اصطلاحی در بازی کودکان

**فیکەواکونا / fîkewakuna/**: ☜ **فیکەکونێ**

**فیکەوەکونێ / fîkewekunê/**: ☜ **فیکەکونێ**

**فیکین / fîkîn/**: ☜ **فیکاندن**

**فیگور / figur/**: ☜ **فیگۆڕ**

**فیگۆڕ / figoř/**: ناو. فیگور؛ ملق؛ بیچم و شێوەی

لەشی کەسێک لە کاتی کردنی کارێکی تایبەتدا ‹فیگۆری وەرزشی› ≌ فیگور

**فیل** / fîl/: ناو. فێل: ١. ئاژەڵی گوانداری ئاڵفخۆر بە پێستی بێ‌تووکی ئەستوور، کەپۆی درێژی لوولەئاسا، دوو ددانی کەلبی درێژ کە عاجی ناوە و لە ڕەگەزی ئەفریقاییدا، بە دوو گوێی زلی باوەشێنییەوە ٢. لە مۆرەکانی گەمەی شەترەنج کە لار دەڕوا و هەر لایەنێک دووانەی هەیە ≌ ١و٢. فیل

**فیلار** / fîlar/: ناو. قۆندەرەی ناڵچەی ئاسن لێ دراو ≌ کفش پاشنه میخی

**فیلال** / fîlal/: ناو. قاپقاپ؛ سۆل؛ قۆندەرەی لە دار ≌ کفش چوبی

**فیلتر** / fîltir/: ☜ **فیلتەر**

**فیلتەر** / fîlter/: ناو. فیلتر: ١. پاڵوانە؛ پاڵوێنە؛ پەرزوانە؛ سافۆ؛ پادزن؛ سافی؛ پارزن؛ ڕاوەک؛ ڕاوک؛ کاغەز و تۆڕی تایبەت بۆ پالاوتن ٢. ئەغزە؛ ئاغزە؛ قونچکە سیغار؛ قنگەسیگار؛ هەورئاسای دەکاغەز پێچراوی بن جغارە ٣. کار و ڕەوتی بەرگری کردن لە گەیشتنی دەنگ و باس و ڕووداوان بە خەڵک لە هەر ڕێگایەکەوە (وەک: ئینترنت، میدیا، سەتەلایت و ...) ≌ ١تا٣. فیلتر

**فیلکە** / filke/: دەنگەناو. حیلکە؛ قاقا؛ دەنگی بەرز پێکەنین ≌ قهقه

**فیلکەفیلک** / filkefilk/: دەنگەناو. حیلکەحیلک؛ تریقەتریق؛ دەنگی پێکەنینی لەسەریەک ≌ هِر- هِر

**فیلم** / fîl(i)m/: ناو. فلیم: ١. پەڕەیەکی نەرم و ڕوون لە جنسی ئەسیتات یان نیتراتی سیلولۆز، کە ڕووەکەی بە ماکێکی هەستۆک بە تیشک داپۆشراوە و بۆ وێنە هەڵگرتن بە کار دێ ٢. زنجیرە وێنەی تۆمارکراوی سەر شریتەیەک لەو جنسە کە لە کاتی ڕوانیندا وەکوو وێنەیەکی بزێو دێتە بەرچاو ≌ ١و٢. فیلم

▣ **فیلم گرتن**: پێک‌هێنانی وێنە لە سەر فیلم ≌ فیلم گرفتن

**فیلم هەڵگرتن**: تۆمار کردنی لە شوێن یەکی وێنەی دیمەن و ڕووداوان لە سەر فیلم بە خێراییەکی هێندێک سەرتر لە لێکدانەوەی چاو (٢٤ وێنە لە چرکەیەکدا) ≌ فیلمبرداری کردن

**فیلماسی** / fîlmasî/: ناو. چەشنێک ماسی خاویار، وەکوو نقە کە دەمیان لە بن سکدایە و لە کرم و وردەماسی و گژ و گیای ئاوژی دەخۆن ≌ فیل‌ماهی

**فیلمساز** / fîlmsaz/: ناو. کەسێ کە کاری فیلم دروست کردنە ≌ فیلم‌ساز

**فیلمگر** / fîlmgir/: ناو. فیلمهەڵگر؛ کەسێ کە کاری تۆمارکردنی وێنەیە لە سەر فیلم، بە کامێرای تایبەت بەو کارە ≌ فیلمبردار

**فیلمنامە** / fîlmname/: ناو. چیرۆک یان نووسراوەیێ کە فیلمی لێ دروست دەکەن ≌ فیلمنامه

**فیلمهەڵگر** / fîlmhełgir/: ☜ **فیلمگر**

**فیلنای** / filnay/: چاوگ. حیلکاندن ≌ شیهه کشیدن

**فیل و فیلەتەن** / fîl û fîleten/: ناو. حەوترینگە؛ جۆرێ خۆراکە ≌ آشی است

**فیلۆ** / filo/: ناوەڵناو. /پلار/ زەبەلاح؛ تەژەی ئەستوور ≌ لندهور

**فیلەتەن** / fîleten/: ناوەڵناو. /کینایە/ فیلەنتەر: ١. زەبەلاح ٢. ئازا و بەکار ≌ ١. پیلتن ٢. شجاع و کاری

**فیلەگیژە** / filegîje/: ناو. هەوێردە؛ کەرەواڵە ≌ بلدرچین

**فیلەگێجە** / filegêce/: ☜ **فیلەگێژە**

**فیلەگێژە** / filegêje/: ناو. فیلەگێجە: ١. شوور؛

جۆرێ کەلەکێوی ٢. هەویردە؛ کەڕەواڵە ≡ ١. نوعی گوزن ٢. بلدرچین

**فیلەنتەر / fîlenter/**: ☜ **فیلەتەن**

**فیلەندەر / fîlender/**: ئاوەڵناو. *[پلار]* زەبەلاحی تەژە ≡ لندهور

**فیلەوان / fîlewan/**: ناو. فیلڵوان؛ ئەوی کاری ڕاگرتن و ئاگاداری لە فیلە ≡ فیلبان

**فیلیای / fîlyay/**: چاوگ. حیلکانەوە ≡ شیهە کشیدن

**فیلیسەرسەرێن / fîlîserserên/**: ناو. یارییەکی مندالانە ≡ از بازی‌های کودکانە

**فین[1] / fîn/**: ناو. ژنبازی؛ دامێن‌تەڕی ≡ زنبارگی

**فین[2]**: ☜ **فینکە**

**فیناز / finaz/**: ناو. ١. کاری عار و ناڕەوا ٢. هەوراز؛ بەرزایی؛ بلندی ≡ ١. کار ناشایست ٢. بُلندی

**فینالْ / fînal/**: ناو. دواهەمین قۆناخی خولێکی کێبەرکێ یان ئەزموون ≡ فینال

**فینجان / fîncan/**: ناو. کووپ؛ پیالە؛ شەبک ≡ فنجان

**فینجە / fînce/**: پێرۆ. ← **ئینجەوفینجە**

**فینکە / fînke/**: ☜ **فینگە**

**فینگە / fînge/**: دەنگ. فین؛ فینکە؛ دەنگی گریان لە بێقلەوە ≡ صدای گریە از بینی

**فینگەفینگ / fîngefîng/**: دەنگەناو. فینکەی زۆر ≡ صدای پیاپی گریە از بینی

**فیننار / finnar/**: ئاوەڵکار. بە توون؛ بە دەرەک؛ بنی جەحانم ≡ درک

**فینۆ / fîno/**: ناو. ١. ئەسپ و ئێستری کورت و کەم‌باڵا ٢. تلە؛ تلۆ؛ تولە قەندی؛ سەگی ڕاو کە بە بۆن و دیتن، شوێنی نێچیر هەڵدەگرێ ٣. فێسی سەری هێندێک عەرەب ≡ ١. اسب و استر قد کوتاە ٢. سگ شکاری ٣. کُلاە و دستار لباس عربی

**فینۆک / fînok/**: ئاوەڵناو. داوێن‌تەڕ (پیاو) ≡ فاسق

**فینە / fîne/**: ناو. فینۆ؛ فێس؛ فێست؛ کڵاوی لبادی سواوەوە کە عەرەب لە سەری دەنێن ≡ نوعی کلاە کە عرب‌ها می‌پوشند

**فیوریيە / fîwrîye/**: ☜ **فیڤریيە**

**فیوز / f(i)yûz/**: ناو. ١. لەتە کانزایەک بە خۆڕاگری کەمەوە کە لە سەرەڕێی هاتنی کارەبا بۆ ناو خولگەیەک دادەنرێ تا ئەگەر لە ڕادەی ڕێ‌پێدراو تێپەڕی، بقرتێ و ڕەوتی کارەبا ببڕێ ٢. کلیلی تەقینەوەی نارنجەک، بۆمبا و... ≡ ١و٢. فیوز

⊡ **فیوز پەڕین**: ١. فیووز تەقین؛ قت بوونی کارەبا بە هۆی دەرپەڕینی فیووزەوە ٢. حەپەسان؛ توان و تاقەتی بیرکردنەوە و هەوڵدانێک تێدا نەمان ≡ ١و٢. فیوز پریدن

**فیە / f(i)ye/**: ناو. فاڵگرەوە؛ گیڕزان؛ فاڵچی ≡ فال‌بین

**فیهرست / fîhrist/**: ☜ **پێرست**

**فێ / fê/**: ناو. ١. فەرکەم؛ پەرکەم؛ فێداری؛ خووداری ٢. پێ؛ کاری ئایسان ٣. ناوی پیتی نۆزدەهەمینی ئەلفوبێی زمانی کوردی ≡ ١. صرع ٢. شعلەوری ٣. حرف فِ؛ نوزدهمین حرف الفبای زبان کُردی

⊡ **فێ خستن**: هەڵکردن؛ پێ کردن؛ ئایساندن ≡ افروختن

**فێ گرتن**: تووشی خووداری بوون ≡ صرعی شدن

**فێت / fêt/**: ناو. دنە؛ هانە؛ کاری هەڵخڕاندن ≡ تحریک

⊡ **فێت دان**: دنەدان؛ هانەدان؛ هەڵخڕاندن ≡ تحریک کردن

**فێتکار / fêtkar/**: ئاوەڵناو. دنەدەر؛ هانەدەر؛ هەڵخڕێن ≡ تحریک‌کنندە

**فێدار / fêdar/**: ناو. خوودار ≡ بیمار صرعی

**فێداری / fêdarî/**: ناو. خێداری؛ عەدرۆیی؛ فێ ف بیماری صرع

**فێده / fêde/**: ☜ **فایده**

**فێر / fêr/**: ئاوەڵناو. ١. تالیمدراو؛ ڕاهاتوو ٢. دەسەمۆ؛ کەوی ٣. خووگرتوو؛ عادەت گرتوو ٤. شارەزا؛ بەڵەد ٥. تەماشا؛ تەمەشا؛ کاری ڕوانین ف ١. آموزش دیده ٢. رام ٣. مُعتاد ٤. بلد ٥. تماشا

⊡ **فێر بوون**: ١. یاد گرتن؛ ڕاهاتن ‹ڕەمزی دڵداری لە زینێ فێر نەبوو یارم دەنا/ کوا ئەویندداری وەفاداری وەکوو من، مەم نەبێ؟ «هێمن»› ٢. ڕام بوون ٣. خوو گرتن ‹بە جگەرە فێر بووە› ف ١. یاد گرفتن ٢. رام شدن ٣. عادت کردن

**فێر کردن**: ١. ڕاهێنان؛ تالیم دان ٢. تووشی عادەتێک کردن؛ موعتاد کردن ‹خەڵک فێری تریاک دەکەن› ٣. تەماشا کردن؛ بۆ ڕوانین ف ١. تعلیم دادن ٢. معتاد کردن ٣. نگاه کردن

**فێربوو / fêrbû/**: ئاوەڵناو. فێربووگ: ١. دەستەمۆ؛ ڕام ٢. ڕاهاتوو؛ تالیمدراو ف ١. خوگرفته ٢. یاد گرفته

**فێربووگ / fêrbûg/**: ☜ **فێربوو**

**فێرز / fêrz/**: ئاوەڵناو. ١. فرز؛ چالاک ٢. ئازا؛ ڕەشید ف ١. فرز ٢. شُجاع

**فێرس / fêris/**: ئاوەڵناو. ئازا؛ قارەمان؛ ڕەشید؛ جامێر ف شُجاع

**فێرست / fêrist/**: ☜ **پێرست**

**فێرغون / fêrğun/**: ☜ **فەرغون**

**فێرکار / fêrkar/**: ناو. ١. ڕاهێن؛ تالیمدەر ٢. دەرسبێژ؛ مامۆستای منالان ف ١. معلم ٢. آموزگار

**فێرکاری / fêrkarî/**: ناو. هین؛ هەفێوت؛ هۆژان؛ ئەو کارانە کە بە مەبەستی فێر کردنی زانست یان شارەزایی لە بوارێکدا بۆ کەسێ ئەنجام دەدرێ ف تعلیم؛ آموزش

**فێرکراو / fêrk(i)raw/**: ئاوەڵناو. مووسایا؛ هەفێوتی؛ ڕاهاتوو ف آموزش‌دیده

**فێرکەر / fêrker/**: ناو. ڕاهێن ف آموزش‌دهنده

**فێرگە / fêrge/**: ناو. ١. جێگەی فێر بوون؛ شوێنی ڕاهاتن ٢. قوتابخانە؛ دەرسخانە ف ١. آموزشگاه ٢. مدرسه

**فێرمەند / fêrmend/**: ناو. مامۆستا؛ فێرکار؛ سەیدا ف اُستاد

**فێرە[١] / fêre/**: ناو. دۆخی پەند وەرگرتن ف حالت پند شنیدن

**فێرە-[٢]**: پێشگر. ڕاهاتوو؛ خۆگرتوو ‹فێرەکار؛ فێرەدرۆ؛ فێرەدزی› ف ـ آموخته؛ عادت‌کرده

⊡ **فێرەکارێک کردن**: بە کارێ ڕاهێنان. هەروەها: **فێرەکارێک بوون** ف کاری را (به کسی) آموختن

**فێرەڕاو / fêreřaw/**: ئاوەڵناو. چەش؛ چەشتە ف شکارآزموده

**فێرەسێوەر / fêresêwer/**: ☜ **قنگەسێوەر**

**فێرەک / fêrek/**: ئاوەڵناو. هۆگر؛ خوو بە شتێ گرتوو ف مأنوس

**فێرەکار / fêrekar/**: ئاوەڵناو. تەی؛ هێکار؛ لەکارزان ف کارامد

**فێرەکارکراو / fêrekark(i)raw/**: ئاوەڵناو. دەرهاتگ؛ ڕاهێنراو ف کارآزموده

**فێرەگۆشت / fêregoşt/**: ☜ **گۆشتخۆر ـ١**

**فێرەگیا / fêreg(i)ya/**: ☜ **گیاخۆر ـ١**

**فێرەلەوەڕ / fêrelewer/**: ئاوەڵناو. چەڕا ف چریدن آموخته

**فێڕا / fêřa/**: ئامراز. دەگەڵ؛ پێڕا ف همراه؛ با

**فێڕنای / fêřnay/**: چاوگ. فیڕاندن ف آبکی ریدن

**فێڕوو / fêřû/**: ☜ **فیڕۆ**

**فێز / fêz/**: ناو. ١. لای سەرووی مەجلس ٢. ئاغەڵە ئاژەڵ ٣. مەیدان؛ گۆڕەپان ٤. فیز؛ بادیهەوایی ف ١. صدر مجلس ٢. آغُل ٣. میدان ٤. فیس

**فێس / fês/**: ناو. ١. تەقیلەی درێژی سوور لە

بەرگنی ساویاو ٢. کلاوی ژنانەی کوردی ☰ ١. کلاه قرمز تُرکان ٢. کُلاه زنانەی کُردی

**فێسان** / fêsan/: چاوگ. گونجان؛ ڕێک کەوتن ☰ امکان یافتن

**فێساندن** / fêsandin/: چاوگ. گونجاندن ☰ مُمکن ساختن

**فێست** / fêst/: ناو. فینە؛ فێس؛ کڵاوی لە لبادی سواوەوە کە زۆرتر عەرەب لە سەری دەنێن ☰ نوعی کلاه عرب‌ها

**فێڤرییە** / fêvrîye/: ☜ **فیڤرییە**

**فێق** / fêq/: ☜ **فێقن**

**فێقن** / fêqin/: ئاوەڵناو. *[پلار]* فێق؛ زەردی لاواز ☰ لاغرمُردنی

**فێقی** / fêqî/: ناو. فیقی؛ فێکی؛ میوە؛ بەری دار کە بۆ خواردن ببێ ☰ میوە

**فێکی** / fêkî/: ☜ **فێقی**

**فێل** / fêl/: ناو. دەفری دەم فرەهـ ☰ ظرف دهانەگُشاد

**فێڵ** / fêł/: ناو. ١. ☜ **فیل** ٢. حیلە؛ سوور؛ گزی ☰ ١. ☜ **فیل** ٢. نیرنگ

◻ **فێڵ** (**لێ**) **کردن**: حیلەوحەواڵە کردن ☰ نیرنگ کردن

**فێڵاوی** / fêławî/: ☜ **فێڵباز**

**فێڵباز** / fêłbaz/: ئاوەڵناو. فێڵاوی؛ فێڵزان؛ فێڵۆ؛ فێڵەباز؛ فێڵەزان؛ فێڵەواز؛ حیلەباز ☰ حُقّەباز

**فێڵبازی** / fêłbazî/: ئاوەڵناو. فێڵزانی؛ فێڵەبازی؛ حیلەبازی ☰ حُقّەبازی

**فێڵپا** / fêłpa/: ناو. نەخۆشینی لاق ئاوسان؛ قاچ پەنەمان ☰ واریس

**فێڵپایە** / fêłpaye/: ناو. پشتیوانەی دیوار؛ کۆڵەکەیەکی ئەستوور لە ناو کاری دیواردا بۆ پتەو بوون و خۆڕاگری زۆرتری دیوار ☰ فیلپا

**فێڵزان** / fêłzan/: ☜ **فێڵباز**

**فێڵکار** / fêłkar/: ئاوەڵناو. فەنەکباز؛ حیلەساز ☰ مَکّار

**فێڵلێکراو** / fêłlêk(i)raw/: ئاوەڵناو. دەسەشکێن؛ هەڵخەڵەتاو ☰ فریب‌خورده

**فێڵوان** / fêłwan/: ☜ **فیلەوان**

**فێڵ و تەڵەکە** / fêł û tełeke/: ناو. فێڵوفەرەج؛ حیلەوحەواڵە ☰ حُقّه و نیرنگ

**فێڵوفەرەج** / fêł û ferec/: ☜ **فێڵ و تەڵەکە**

**فێڵۆ** / fêło/: ☜ **فێڵباز**

**فێڵەباز** / fêłebaz/: ☜ **فێڵباز**

**فێڵەبازانە** / fêłebazane/: ئاوەڵکار. سەگانە ☰ حیله‌گرانه

**فێڵەزان** / fêłezan/: ☜ **فێڵباز**

**فێڵەمانگ** / fêłemang/: ناو. جۆرێک زگچوونی درێژخایەنە ☰ نوعی اسهال مُزمن

**فێڵەواز** / fêłewaz/: ☜ **فێڵباز**

**فێم** / fêm/: ☜ **فام**

**فێمنەکری** / fêmnek(i)rî/: ئاوەڵناو. نەزانەدراو؛ نەزانراو ☰ درک‌نشده

**فێمینیست** / fêmînîst/: ئاوەڵناو. لایەنگری فێمینیسم ☰ فمینیست

**فێمینیسم** / fêmînîsm/: ناو. ١. لایەنگری لە یەکسانی مافی ژن و پیاو لە کۆمەڵگادا ٢. بیرۆکەی یەکسانی رامیاری، ئابووری و کۆمەلایەتی ژن و پیاو ☰ ١و٢. فمینیسم

**فێنک** / fênik/: ئاوەڵناو. فوونک؛ نە گەرم نە زۆر سارد ☰ خُنک

**فێنکاوی** / fên(i)kawî/: ☜ **فێنکی**

**فێنکایەتی** / fên(i)kayetî/: ☜ **فێنکی**

**فێنکایی** / fên(i)kayî/: ناو. ١. ☜ **فێنکی** ٢. جێگای فێنک ‹با بچینە ئەو فێنکاییە› ☰ ١. ☜ **فێنکی** ٢. جای خُنک

**فێنکی** / fên(i)kî/: ناو. فوونکایی؛ فوونکی؛ فێنکاوی؛ فێنکایەتی؛ فێنکایی ☰ خُنکی

# ڤ

**ڤ** / v/: پـت. نیشانەی بیستەمین پیتی ئەلفوبێ زمانی کوردی ▤ نشانەی حرف بیستم الفبای زبان کردی

**ڤ**[1] / vi/: ناو. نـاوی بیسـتەمین پـیتی ئـەلفوبێ زمانی کوردی ▤ حرف بیستم الفبای زبان کُردی

**ڤ**[2]: ئامراز. دەگەڵ؛ وێڕا؛ پێڕا ▤ با؛ حرف همراهی

**ڤا**[1] / va/: نـاو. ١. با؛ وا ٢. پەنامی ئەندامانی لـەش ٣. شڵەژاوی؛ شێواوی ٤. باو؛ پێچ ٥. قەرز؛ واو؛ وا ▤ ١. باد ٢. ورم ٣. آشفتگی ۴. پیچ؛ تاب ۵. وام

⊡ **ڤا برن**: داچڵەکیان؛ ڕاچەنین ▤ یکّه خوردن

**ڤا دان**: ١. بادان؛ پێچ دان ٢. قـەرز پـێ دان ▤ ١. تاب دادن ٢. وام دادن

**ڤا دانەوە**: وام/ قەرز دانەوە ▤ پس دادن وام

**ڤا**[2]: جێناو. ١. ئەم؛ ئی ٢. ئەو ٣. ئەوە ٤. ئەمان ٥. ئەوان ▤ ١. این ٢و٣. آن ۴. اینها ۵. آنها

**ڤا**[3]: ئـامراز. ڤایە؛ وا؛ ئەوەتا؛ ئـەوەتانێ ‹ئـەرێ دایـێ مەترسە ڤا مە هاتم/ وەکـی ڕۆژم نهـا ڤـا مـە هـلاتم «جگەرخوێن»› ▤ خودش است (معادل دقیق فارسی ندارد)

**ڤا**[4]: ☜ **ڤە**[5]

**ڤاپۆر** / vapor/: ناو. گەمیە؛ کەشتی ▤ کشتی

**ڤاتەی** / vatey/: چاوگ. وتن؛ گوتن ▤ گفتن

**ڤاج** / vac/: ناو. گۆشە؛ کونج؛ سووچ ▤ گوشه؛ کُنج

**ڤاجا**[1] / vaca/: ناو. ئاسەڕ ▤ آستر

**ڤاجا**[2]: ☜ **ڤاژی**

**ڤاجـایی** / vacayî/: نـاو. ١. ڕاسـتی؛ ڕاسـی؛ ڕاستەقانی ٢. وەگەڕاوی؛ ئاوەژوویی؛ بـەراوەژۆیی ▤ ١. حقیقت؛ راستی ٢. واژگونی

**ڤاجی** / vacî/: ☜ **ڤاژی**

**ڤاچ** / vaç/: ناو. ١. ئاقار؛ شوێن ٢. تەنشـت؛ لا ▤ ١. منطقه ٢. کنار؛ جانب

**ڤادار** / vadar/: ئاوەڵناو. ١. بـادار؛ پەنـەماو؛ بـا دە لەش وەستاو ٢. قەرزدار؛ دەیندار ▤ ١. ورم کـرده ٢. بدهکار

**ڤار** / var/: ناو. ١. هەوار؛ زۆزان؛ هاوینـە هـەواری خێلات ٢. ☜ **ڤارک** ▤ ١. ییلاق ٢. ☜ **ڤارک**

**ڤاران** / varan/: ناو. واران؛ باران ▤ باران

**ڤارقلانـدن** / varq(i)landin/: چـاوگ. وە درەنـگ خستن؛ خستنە دواوە ▤ به تأخیر انداختن

**ڤارقلین** / varq(i)lîn/: چـاوگ. ١. زۆر خایاندن ٢. وە درەنگ خستن؛ خسـتنە دواوە ٣. وە درەنـگ کەوتن ▤ ١. طول کشیدن ٢. به تأخیر انداختن ٣. به تأخیر افتادن

**ڤارک** / varik/: نـاو. ڤار؛ بارۆکە؛ وارۆک ▤ جوجەی بهاره

**ڤارنەی** / varney/: چاوگ. باراندن ▤ باراندن

**ڤارەی / varey/**: چاوگ. بارین 🇮🇷 باریدن

**ڤاری / varî/**: ئاوەڵناو. ١. تەنێ؛ تەنیا ٢. بەرپیوار؛ نادیار 🇮🇷 ١. تنها ٢. پنهان

⊡ **ڤاری بوون**: گوم بوون لە بەر چاو؛ دیار نەبوون 🇮🇷 پنهان بودن

**ڤارین / varîn/**: چاوگ. بارین؛ وارین 🇮🇷 باریدن

**ڤاژی**[١] **/ vajî/**: ئاوەڵناو. ڤاجی؛ ڤاجا؛ ڤەژۆ؛ وەرگەڕاو؛ ئاوەژوو؛ بەراوەژوو ‹مونقەلیب من دی مەنازیل ڤاژی ئەو سەیرێ دکن/ یەک ب یەک خوون ژێ دبارن ئاتەش و لەمع و شەهاب «مەلای جزیری»› 🇮🇷 وارونه

**ڤاژی**[٢]: ئاوەڵکار. ڤاجی؛ ڤاجا؛ ڤەژۆ؛ پێچەوانە؛ بەراوەژوو ‹ئەز گەهام ئاڤا حەیاتێ خەف ژ دل/ خوزر ڤاژی چوویە حەیوانێ غەلەت «مەلای جزیری»› 🇮🇷 وارونه

**ڤاستا / vasta/**: ئاوەڵناو. هەڤپشت؛ پشتیوان 🇮🇷 پشتیبان

**ڤاش / vaş/**: ناو. ڕەوک؛ گیا 🇮🇷 گیاه

**ڤاشتووری / vaştûrî/**: ناو. جۆرێ داسی دروێنە 🇮🇷 نوعی داس

**ڤاشیزم / vaşîzm/**: ☜ فاشیسم

**ڤاکور / vakur/**: ئاوەڵناو. دەلال؛ سپەهی؛ ڕند؛ کەشخە؛ جوان 🇮🇷 زیبا

**ڤاگینا / vagîna/**: ناو. مناڵدان؛ منداڵدان؛ زێدان 🇮🇷 زهدان

**ڤال / val/**: ئاوەڵناو. ١. کراوە؛ پێوەنەدراو؛ دانەخراو ٢. فرەه؛ گوشاد ٣. *[کنایی]* کیفدەم؛ مرۆی دەم گەورە ٤. خوار؛ خێچ؛ چەوت 🇮🇷 ١. باز؛ گشودە ٢. گُشاد ٣. دهن‌گشاد ۴. کج

**ڤالا / vala/**: ئاوەڵناو. ڤالاگەه: ١. بەتاڵ؛ خاڵی؛ پووک؛ بێناوەرۆک ٢. ئاواڵە؛ کراوە 🇮🇷 ١. تُهی ٢. گشوده

**ڤالاکەر / valaker/**: ناو. فەرغون؛ فرغوون 🇮🇷 فرغون

**ڤالاگەه / valageh/**: ☜ ڤالا

**ڤالاهی / valahî/**: ناو. ڤالایی؛ بەتالایی؛ بۆشایی 🇮🇷 فضای خالی

**ڤالایی / valayî/**: ☜ ڤالاهی

**ڤالە / vale/**: ئاوەڵناو. ١. چۆڵ؛ بێئاوەدانی ٢. بێکار 🇮🇷 ١. خالی از سکنه ٢. بیکار

**ڤالی / valî/**: ناو. چۆڵی؛ دۆخی ئاوەدانی لێ نەبوون 🇮🇷 حالت خالی بودن از سکنه

**ڤامتۆیی / vamtoyî/**: ئاوەڵناو. ڤەزماڵۆکی؛ کێشئاسا؛ بە تایبەتمەندی کێش هاتن و چوونەوە سەر دۆخی خۆ 🇮🇷 کشسان

**ڤامتی / vamtî/**: ناو. ڤەزەلاندی؛ ڤەزەلایی؛ ڕاکێشراوی؛ کار و ڕەوتی کێشان 🇮🇷 کشش

**ڤان**[١] **/ van/**: ناو. پێویستی؛ چۆنیەتی پێویست بوون 🇮🇷 بایستگی؛ ضرورت

**ڤان**[٢]: جێناو. ١. ئەوان ‹کوو ڤان لەتیفان گولعیزار/ شۆنا گولان روستینە خار «مەلای جزیری»› ٢. ئەمان ‹حەزز و لەززەت مە ب عومرێ خوە د عیشقا تە نەدی/ هەم ب ڤان دەرد و غەمان زێدە تو ئیسال چ حەز؟ «مەلای جزیری»› 🇮🇷 ١. آن‌ها ٢. این‌ها

**ـ ڤان**[٣]: پاشگر. ـ بان؛ ـ وان ‹باغڤان› 🇮🇷 ـ بان

**ڤانا / vana/**: جێناو. ئەوانە 🇮🇷 آن‌ها

**ڤانی / vanî/**: ئاوەڵکار. ئاوا؛ بەم جۆرە 🇮🇷 این‌طور

**ڤانێ هانا / vanê hana/**: جێناو. ئەوانەی دوور 🇮🇷 آن‌ها (در دوردست)

**ڤاهاندن / vahandin/**: چاوگ. گوتنەوە؛ وتنەوە 🇮🇷 بازگو کردن

**ڤایرووس / vayrûs/**: ناو. ویرووس: ١. هۆکاریکی وردیلەی چڵک و تەشەنایە کە تەنیا لە نێو خانەی زیندووی گیانداراندا ڕوو لە گەشە و زیاد بوون دەکا، هۆی زۆرێک نەخۆشی وەک شەپلەی منالان، سووریجە، ئایدز و هاریە ٢. *[کنایی]* بەرنامەیەکی کەمپیوتەری بۆ تێکدانی کار و ڕەوتی ئاسایی کەمپیوتەر 🇮🇷 ١و٢. ویروس

**ڤایه** / vaye/: ئامراز. ڤـا؛ ئـەوەتا؛ ئـەوەتانێ ‹ڤـایە هات!› ☰ اینک (معادل دقیق فارسی ندارد)

**ڤت** / vit/: دەنگەناو. جرت؛ شیڕ؛ عەفتە ☰ شیشکی

**ڤتن** / v(i)tin/: چاوگ. وتن؛ گوتن ☰ گفتن

**ڤجر** / vicr/: ئاوەڵناو. خێل؛ خوێل؛ چاولار ☰ لوچ

**ڤچ** / viç/: دەنگەناو. ڤرچ؛ دەنگی جۆشـینی چڵـک لە کوان ☰ صدای جوشش چرک از زخم

**ڤر**[1] / vir/: ناو. فڕ؛ درۆ ‹ڤر، نابـە راسـت، راسـت ژی نابە ڤر «مەسەل»› ☰ دروغ

**ڤر**[2]: جێناو. ئەیرە؛ ئێرە ☰ اینجا

**ڤرا** / v(i)ra/: ئاوەڵکار. لێرە؛ لێرەوە؛ لە ئێـرەوە ☰ از اینجا

**ڤراستەی** / v(i)rastey/: چاوگ. دوورین ☰ دوختن

**ڤراسەی** / v(i)rasey/: چاوگ. دوورین ☰ دوختن

**ڤـرت**[1] / virt/: نـاو. *[پـلار]* ١. قسـەی بـن‌شـڕ؛ حەلەق‌مەلەق ٢. فشە؛ درۆ ☰ ١. یاوە ٢. دروغ

**ڤرت**[2]: ئاوەڵناو. فرت؛ گوشاد ☰ گُشاد

**ڤرتۆ** / virto/: ئاوەڵناو. *[پلار]* درۆزنی خۆ بە زل زان ☰ خالی‌بند

**ڤرتـۆقی** / virtoqî/: ئاوەڵـناو. *[پـلار]* دەسـبڕ؛ ساختەچی ☰ حیلەگر

**ڤرتۆنی** / virtonî/: ئاوەڵناو. گەنەڕەنگ؛ بـەدڕەنگ ☰ بدرنگ

**ڤرتێ** / virtê/: ئاوەڵناو. *[پلار]* فرتۆڵ؛ جـوێنی ژنانـە بە مانا هەرزە ☰ دُشنام زنانه در مفهوم روسپی

**ڤرچ** / virç/: ☜ **ڤچ**

**ڤرچاڤرچ** / virçavirç/: ☜ **فلچ‌وهۆڕ**

**ڤرچالـە** / virçale/: ئاوەڵـناو. *[پـلار]* فـەرچالە؛ ترسەنۆک؛ ترسۆنەک ☰ ترسو

**ڤرچقاندن**/ virç(i)qandin/: چاوگ. ١. پێشاندنەوە؛ پلیخاندنەوە ٢. لاواز کردنـەوە ☰ ١. لـە کـردن ٢. تضعیف کردن

**ڤـرچقین** / virç(i)qîn/: چـاوگ. ١. پلـیخانەوە؛ پلیشانەوە ٢. لاواز بوون؛ لەڕ بوون؛ کز بوون ☰ ١. له شدن ٢. ضعیف شدن

**ڤرچک** / virçik/: نـاو. *[شـوورەیی]* زێ؛ کـوز؛ قـوز؛ شەرمی ژن ☰ کُس؛ آلت تناسلی زن

**ڤردا** / virda/: ئاوەڵکار. ڤردە؛ بێرەدا ☰ از این‌جا

**ڤردە** / virde/: ☜ **ڤردا**

**ڤردەوێدا** / virdewêda/: ئاوەڵکار. لێرە و لـەوێ ☰ از اینجا و آنجا

**ڤرسۆ** / virso/: ناو. برووسکە ☰ آذرخش

**ڤرسه** / virsih/: ناو. پارێزکاری؛ چاودێری؛ نیگاوانی ☰ نگهداری

**ڤرسهاندن** / virs(i)handin/: چـاوگ. چـاودێری کردن؛ ئاگاداری (لێ) کردن ☰ محافظت کردن

**ڤرک** / virk/: ناو. چێشتی دانەوێڵـەی وردکـراو ☰ آش کوبیدەی حبوبات

**ڤرگولی** / virgulî/: ناو. ڕەنگی خەنـەیی ☰ حنـایی رنگ

**ڤرمۆر** / virmor/: نـاو. ڕەنگی تاریک و مـات؛ دژی ڕەنگی ئاچوخ ☰ رنگ مات و تیره

**ڤرنـی**[1] / virnî/: نـاو. ١. تۆمـێ کـە لـە زسـتاندا دەچێندرێ ٢. کەمێڵـی پـەز ☰ ١. بـذری کـە در زمستان می‌کارند ٢. گال گوسفند

**ڤرنی**[2]: ئاوەڵناو. ١. تازەداهاتوو ٢. دێر لە دایک بوو ☰ ١. نورسیده ٢. دیر به دنیا آمده

**ڤرۆڤی** / v(i)rovî/: نـاو. گۆشتی باش کولاو کە لـە پێشە جیا بۆتەوە ☰ گوشت کاملاً پخته

**ڤره** / v(i)re/: جێناو. ڤر؛ ئێره ☰ اینجا

**ڤرەتـەی** / v(i)retey/: چاوگ. فرۆشتن؛ فـرۆتن ☰ فروختن

**ڤرەشـیەی** / v(i)reşyey/: چـاوگ. فرۆشـران؛ فرۆشیان ☰ فروخته شدن

**ڤڕ**[1] / viř/: نـاو. ١. درۆ؛ فشە ٢. بوختیان؛ بوختـان ٣. ئاخلێف؛ بافیش و دەلەسە ٤. فڕ؛ قومێـک لـە

شتی تـراو ٥. ڤڕاسـە؛ حەپـە؛ وەڕە ☰ ١. دروغ ٢. تُهمت ٣. فریب ۴. جُرعه ۵. پارس سگ

▣ **ڤڕ کردن**: ١. درۆ گوتن ٢. بوختیـان کـردن ٣. خواردنـەوە ☰ ١. دروغ گفـتن ٢. تُهمـت زدن ٣. نوشیدن

**ڤڕ**[٢]: ☜ **ڤڕکەر**

**ڤڕاسە** / v(i)řase/: ناو. ڤڕ؛ وەڕە؛ حەپەی سەگ ☰ پارس سگ

**ڤڕاڤە** / v(i)řave/: نـاو. وڕاوە؛ وڕینـە؛ پاتـەران ☰ هذیان

**ڤڕبێژ** / viřbêj/: ئاوەڵـناو. هـەرزەگۆ؛ گـەفۆک ☰ یاوەگو

**ڤڕڕە**[١] / viřře/: ناو. وروڕە؛ لەیستۆکێکی زارۆکانە لە قالۆر دەیکەن و ڤرەڤری دێ ☰ نوعی اسباب‌بازی

**ڤڕڕە**[٢]: دەنـگ. ڤڕ؛ ڤرە؛ دەنگی خێـرا سـووڕانەوەی شتی خڕی ناوبەتاڵ ☰ صدای چرخش سریع شـیء مُدور کاوک

**ڤڕڤڕاندن** / viřviřandin/: چـاوگ. تـلار کردنـەوە؛ جاڵە کردن ☰ غلتانیدن

**ڤڕڤڕک** / viřv(i)řk/: ناو. بەلەک و مەچەکی پێ ☰ ساق و مُچ پا

**ڤڕڤڕە** / viřv(i)ře/: ☜ **ڤڕکەر**

**ڤڕڤڕین** / viřv(i)řîn/: چـاوگ. خلـۆر بوونـەوە ☰ غلتیدن

**ڤڕک** / viřk/: نـاو. ١. سـنگ؛ مێخـی ئەسـتوور ٢. دانووی کـولاو کـە دەدرێ بـە بێچـووی سـاوای ئاژەڵ ٣. بەلەفیرە؛ تەقەفیرە؛ دۆخـی زگ چـوون ☰ ١. میخ کلفت ٢. حبوبات آب‌پز که به نوزاد احشـام دهند ٣. اسهالی

**ڤڕکا** / viřka/: ناو. ڤڕۆ؛ درۆ؛ فشە ☰ دروغ

**ڤڕکەر** / viřker/: ئاوەڵـناو. ڤڕ؛ ڤرە؛ ڤڕڤرە؛ ڤـڕۆکەر؛ ڤرەک؛ درۆزن ☰ دروغگو

**ڤڕۆ**[١] / v(i)řo/: ناو. ڤڕکا؛ درۆ؛ فشە ☰ دروغ

**ڤڕۆ**[٢]: ئاوەڵناو. ڤڕکەر؛ درۆزن؛ فشەباز ☰ دروغگو

**ڤڕۆکەر** / v(i)řoker/: ☜ **ڤڕکەر**

**ڤڕە** / v(i)ře/: ☜ **ڤڕکەر**

**ڤڕەک** / v(i)řek/: ☜ **ڤڕکەر**

**ڤـڕین** / v(i)řîn/: چـاوگ. ڕابـوون؛ هەسـتانەوە؛ هەڵسانەوە ☰ برخاستن

**ڤڕێ** / v(i)řê/: ئاوەڵناو. *[ناشیرین]* ١. درۆزن (ژن) ٢. ڕووت؛ پەتی؛ ڕووس (تێبینی: وەکوو جنێوێـک بـە ژنان دەگوترێ) ☰ ١. دروغگو (زن) ٢. لُخت؛ برهنه

**ڤـز**[١] / viz/: نـاو. ١. ☜ **ڤـزك ـ٢** ٢. وەڕەزی؛ عاجزی؛ عێدزی ☰ ١. ☜ **ڤزك ـ٢** ٢. عصبانیت

**ڤز**[٢]: ئاوەڵناو. ١. سست؛ خـاو ٢. کەمووسـکە ☰ ١. سُست ٢. بسیار کم

▣ **ڤز بون**: شل بوونەوە لە کار کردن؛ خاو بوونەوە ☰ دلسرد شُدن در انجام کار

**ڤـز**[٣]: دەنگـەناو. دەنگـی مـێش و زەرگەتـە ☰ وِز؛ صدای مگس و زنبور

**ڤزڤاندن** / vizvandin/: ☜ **ڤەنشتن**

**ڤزڤز** / vizviz/: دەنگـەناو. دەنگـی زۆری مـێش و زەرگەتە ☰ وِز-وِز

**ڤزک** / viz(i)k/: نـاو. ١. چـەقۆی دەمپـان ٢. ڤـز؛ خولخولە؛ خولوو؛ کەرخول؛ تەرخول ☰ ١. چاقوی پهن ٢. گردنای بازی

**ڤزکان** / vizkan/: چاوگ. ١. هەڵقوڵـین (ئـاو یـان تراوی تر) ٢. فیچقە کردن (ئاو یان تراوی تر) ☰ ١. از زمین جوشیدن ٢. فَوَران کردن

**ڤزکانـدن** / vizkandin/: چـاوگ. ١. هەڵـقوڵاندن (ئاو یان تراوی تر) ٢. فیچقە پـێ کـردن (ئـاو یـان تراوی تر) ☰ ١. آب را از زمـین جوشـاندن ٢. فَـوَران دادن

**ڤـزە** / v(i)ze/: نـاو. پرخـە؛ خرپـف؛ خرپـۆق ☰ خُرناسه

**ڤزەڤز** / v(i)zeviz/: دەنگەناو. ١. پرخەپرخ ٢. ڤزـــ

**ڤز** ☰ ١. خُرناسەی پیاپی ٢. وز- وز

**ڤــزەک / v(i)zek/**: ناوەڵــناو. خـــــۆوەدوادەر؛ کەمتەرخەم لە کار کردن ☰ سهل‌انگار

**ڤزین / v(i)zîn/**: چاوگ. ١. پرخە کردن ٢. خـوڕە کردنی ئـاوی ڕەوان ٣. دەرهـاتنی دەنگـی وەک گوللەی هـاوێژراو ‹ڤزینا تـیر و گـولان› ٤. وژەوژ کردنی بای بەهێز ‹ڤزینا بایێ› ٥. وێک کـەفتنی کانزای زێڕ و زێو ‹ڤـزینا خـەلخال› ٦. دەرهـاتنی دەنگی فڕینی مێش و هەنگ و ... ‹دونیا خـوەش و تاف بوو، ڤزینا مێشێن هنگیڤ بـوو› ☰ ١. خُرنـاس کشیدن ٢. شُرشُر کردن آب ٣. صدا کردن تیر و مانند آن ٤. زوزه کشیدن باد ٥. به هم خوردن زیورآلات ٦. وز - وز کردن

**ڤزێ / v(i)zê/**: ناوەڵـناو. دەرکـراو؛ بەرەڵـداکراو ☰ رانده شده

**ڤژ / vij/**: دەنـگ. ١. دەنگی تـەنێ کـە زۆر بەلـەز تێپەڕێ (وەک گوللە) ٢. دەنگی ئاو کە بە تـەوژم دەرپەڕێ ☰ ١. صدای عبـور جسـم سـریع‌السـیر ٢. صدای آبی که با فشار بیرون جهد

**ڤژاب / v(i)jab/**: ناو. حەزیا؛ عەزیا؛ زەها ☰ اژدها

**ڤـژاگ / v(i)jag/**: نـاو. ڤـژانگ؛ کـاری پشـک هاویشتنی خۆوبەخت ☰ قُرعەکشی

**ڤـژان / v(i)jan/**: چـاوگ. شلـــەقان؛ شلـــەقیان؛ شلەتین؛ شەقران؛ ڕاژانی تراو لە دەفردا ☰ به هم خوردن مایع در ظرف

**ڤژانــدن / v(i)jandin/**: چـــاوگ. ١. ژانـــــدن؛ ڕاتلەکاندنی تراو لـە دەفـرا ٢. *[کنایی]* ژیاندنـەوە؛ زیندوو کردنەوە ☰ ١. تکان دادن مایع در ظـرف ٢. احیا کردن

**ڤژانگ / v(i)jang/**: ☜ **ڤژاگ**

**ڤژانەوە / v(i)janewe/**: چاوگ. بووژانەوە؛ هێز تێ کەوتنەوە ☰ سرحال آمدن

**ڤژاو / v(i)jaw/**: ناو. بناوانی دابەش کردنی ئاو بـۆ وەرزێران ☰ مرکز تقسیم آب آبیاری

**ڤژک / vij(i)k/**: ناو. فیرە؛ بەلەفیرە ☰ مدفوع آبکی

**ڤژۆ / v(i)jo/**: ناو. زگچوون؛ ڕەوانی ☰ اسهالی

**ڤـژۆک / v(i)jok/**: ناوەڵـناو. زگـڕەوان؛ زگچـوو ☰ اسهال

**ڤژۆکەر / v(i)joker/**: ناو. دەرمانی ڕەوانی ☰ مُسهل

**ڤژین / v(i)jîn/**: چاوگ. ڤیزین؛ ویزە و گڤە کردن ☰ وز - وز کردن

**ڤڤ**[1] **/ viv/**: دەنـگ. دەنگی تێپەڕینی شتی باریک و تیژ یا شتێ کە توند تێپەڕێ ☰ صـدای دررفـتن اشیای تیز

**ڤڤ**[2]: سارستە. بڤە؛ خەتەر (وشەی ئاگـادار کردنـەوە) ☰ بپا (کلمەی تحذیر)

**ڤکی / v(i)kî/**: ناوەڵـکار. یـەکجاری؛ ئێکجـارەکی؛ تێکڕایی ☰ یکباره؛ تماماً

**ڤل / vil/**: ناوەڵـناو. ١. بڵ؛ ڤەڵ؛ ڕەقی نەرم بـووگ (بۆ دمەڵـی دەڵـێن) ٢. هـەراو؛ وڕاق؛ فـرت ☰ ١. سختِ نرم‌شده (برای دُمل گفته می‌شود) ٢. گُشاد

**ڤلت / vilt/**: نـاو. ڕەوتی تەقینــەوە؛ لەبــەر یــەک چوون ☰ انفجار

**ڤلڤلک / vilv(i)lik/**: نـاو. بان مەلاشوو؛ پێشە سـەر ☰ آهیانه

**ڤلڤلە / vilv(i)le/**: ناوەڵناو. *[بەلار]* فرەوێـژ؛ زۆربلـێ؛ چەقەسرۆ؛ چەنەباز ☰ وراج

**ڤلک / vilk/**: ناو. گورچیلە؛ گورچەویلە ☰ کلیه

**ڤلۆشە / v(i)loşe/**: نـاو. بـرویش؛ سـاواری زۆر ورد ☰ بلغور ریز

**ڤلێ / v(i)lê/**: ناو. گوڵ ☰ گُل

**ڤن / vin/**: دەنگ. دەنگێ وەک دەنگی بەر بـوونی ژێی کەوان ☰ صدای مانند رها شدن زه کمان

**ڤۆک / vok/**: دەنگ. دۆڵ؛ میـز؛ خـوش (دایـک بـۆ منالی دەڵێ کە میز بکا) ☰ شـاش (کلمـەی تشـویق بچه به شاشیدن)

**ڤۆلت** / volt/: ناو. ووڵت؛ یەکەی پێوانی وزەی ڕەوتی کارەبا 🇮🇷 ولت

**ڤە**[١] / ve/: ئاوەڵناو. ئاواڵە؛ باز ‹دەریّ ڤە کە!› 🇮🇷 باز؛ وا

**ڤە**[٢]: جێناو. ١. ئێوە؛ ئەنگۆ ٢. ئەوە ‹ڤە چینە؟› 🇮🇷 ١. شما ٢. آن

**ڤە**[٣]: پیت. وە؛ بۆ؛ بۆ لای ‹کێ ڤە دەچی؟› 🇮🇷 بە (حرف اضافه)

**ڤە**[٤]: ئامراز. لەگەڵ؛ لەتەک؛ وشەی پێڕایی ‹ڤە منرا وەرە!› 🇮🇷 با (حرف همراهی)

**ڤە -**[٥]: پێشگر. ڤا ـ ، ـ ڤە؛ وە ـ: ١. ئاواڵە؛ باز ‹ڤەبوون› ٢. دووپاتە ‹چیرۆکێ بۆ مە ڤەگەڕێنە› 🇮🇷 ١. وا ـ ٢. باز ـ

| | | |
|---|---|---|
| ڤەئانین | ڤەبژارتن | ڤەبرن |
| ڤەبراندن | ڤەبرووتن | ڤەبریان |
| ڤەبرین | ڤەبزداندن | ڤەبزدیان |
| ڤەبژکان | ڤەبژکاندن | ڤەبونژین |
| ڤەبوهوژین | ڤەبوون | ڤەبەستن |
| ڤەبێتن | ڤەپاچین | ڤەپچراندن |

**ڤەئانین** / ve'anîn/: چاوگ. قەرەبوو کردنەوە؛ بۆبژاردنەوە 🇮🇷 جُبران کردن

**ڤەئینان** / ve'înan/: چاوگ. دانان؛ نیان ‹بێ‌گومان خاکا ڕیا وێ تووتیا و دانەیە/ گەر د چەهڤێن کور ڤەئینن خوەش دبن پێ دیدەیە «مەلای جزیری»› 🇮🇷 نهادن؛ گذاشتن

**ڤەبرارتن** / veb(i)rajtin/: چاوگ. هەڵبژاردن؛ جیاکردنەوە؛ نەقاندن 🇮🇷 انتخاب کردن

**ڤەبرن** / veb(i)rin/: چاوگ. ١. قازانج کردن؛ بەهرە بردن ٢. بردنەوە (لە کایە و قومار) 🇮🇷 ١. سود بُردن ٢. برنده شدن (در بازی)

**ڤەبڕ** / vebiř/: ناو. کاری بڕینەوەی قەرارـ مەدار 🇮🇷 کارِ تمام کردن مُعامله

**ڤەبڕاندن** / veb(i)řandin/: چاوگ. قڕ کردن؛ لە ناو بردنی بەکۆمەڵ 🇮🇷 قتل‌عام کردن

**ڤەبڕک** / vebiřk/: ناو. جۆرێ کولێرەی بە هێلکە و شیر و ڕۆن 🇮🇷 نوعی گرده نان روغنی با تخم مرغ و شیر

**ڤەبڕووتن** / veb(i)řûtin/: چاوگ. ڕووتاندنەوە؛ پەڕ و تووک لێ داماڵین 🇮🇷 کندن پر و مو

**ڤەبڕی** / veb(i)řî/: ئاوەڵناو. بڕاوە؛ بڕیار دراو 🇮🇷 مُقرر

**ڤەبڕیان** / vebiřyan/: چاوگ. بڕانەوە؛ قڕ تێ کەوتن؛ لە ناو چوون 🇮🇷 نابود شدن

**ڤەبڕین** / veb(i)řîn/: چاوگ. ١. بڕینەوەی نرخ ٢. دوایی هێنان بە کێشە ٣. بڕینەوەی هەنگ ٤. بڕینەوەی مەڕ و بزن ٥. بڕیاری یەکجارەکی دانان ٦. دوا بڕانی بنەماڵە 🇮🇷 ١. قطعی کردن نرخ ٢. پایان دادن به مُشاجره ٣. برداشتن عسل از کندو ۴. چیدن پشم و موی احشام ۵. قرار قطعی گذاشتن ۶. مُنقرض شدن خانواده

**ڤەبزداندن** / vebizdandin/: چاوگ. ١. پساندنەوە ٢. ترساندنەوە 🇮🇷 ١. واگُسستن ٢. بازترساندن

**ڤەبزدیان** / vebizd(i)yan/: چاوگ. ڤەبزدین: ١. پسان؛ قرتان؛ پچڕان ٢. ترسان؛ ترسیان 🇮🇷 ١. گُسستن ٢. ترسیدن

**ڤەبزدین** / vebizdîn/: ☜ **ڤەبزدیان**

**ڤەبژکان** / vebijkan/: چاوگ. ڤەبژکیان؛ ڤەبژکین؛ پرژان 🇮🇷 پراکنده شدن

**ڤەبژکاندن** / vebijkandin/: چاوگ. پرژاندن؛ پەرژوبلاو کردن 🇮🇷 پراکندن

**ڤەبژکیان** / vebijk(i)yan/: ☜ **ڤەبژکان**

**ڤەبژکین** / vebijkîn/: ☜ **ڤەبژکان**

**ڤەبونژین** / vebunjîn/: چاوگ. پژمین؛ پشمین؛ پنژین 🇮🇷 عطسه کردن

**ڤەبوهوژین** / vebuhujîn/: چاوگ. تاویانەوە؛ توانەوە 🇮🇷 آب شدن

**ڤەبـور / vebûr/**: نـاو. پاشـەکەوت؛ پەزمەنـدە؛ بازمان؛ پاشەناز 🇮🇷 اندوخته؛ پس‌انداز

**ڤـەبـوون / vebûn/**: چـاوگ. کرانـەوە؛ بـاز بـوون ‹هێدی ل کەمانێ بدە ئەی موتربێ دەمساز!/ سەد دل بۆ ڤەبن بەستنە هەریەک ب دوسەد ناز «خانی»› 🇮🇷 باز شدن؛ گشوده شدن

**ڤەبەستن / vebestin/**: چـاوگ. وەبەسـتن؛ بەستنەوە ‹بسکا سیا رەعنایە مەست/ یەکدی ب حەیران پێ ڤەبەست «مەلای جزیری»› 🇮🇷 بند کردن؛ بستن

**ڤەبێتن / vebêtin/**: چاوگ. دابێژتنەوە؛ دووبارە لـە هێلەک دانەوەی ئارد 🇮🇷 دوباره بیختن

**ڤـە پاچین / vepaçîn/**: چـاوگ. ١. داپـاچین؛ پەرتاوتن ٢. برین بە برینگ و تۆرتۆ 🇮🇷 ١. هَرَس کردن ٢. قیچی کردن

**ڤە پاریان / vepařyan/**: چاوگ. پاڕانـەوە؛ لالانـەوە 🇮🇷 التماس کردن

**ڤە پچڕاندن / vepiçřandin/**: چاوگ. ١. پسـاندن؛ قرتانن؛ پچڕاندن ٢. دڕانـدن؛ شـڕ کـردن ٣. لـە هەموو لاوە تێ‌شێشان و ئازار دان ٤. *[کنایی]* شـی کردنەوە؛ بە وردی مانا لێدانەوە 🇮🇷 ١. پاره کردن ٢. گُسستن از ٣. هر طرف حمله بردن و آزُردن ٤. تفسیر کردن

**ڤە پرژنین / vepirj(i)nîn/**: چاوگ. پەرتاوتن؛ پرژ و لک داپاچین 🇮🇷 هَرَس کردن

**ڤـە پرژیان / vepirj(i)yan/**: چـاوگ. ڤـەپرژین؛ پرژان؛ بلاو بوونەوە 🇮🇷 پخش و پراکنده شدن

**ڤە پرژین / vepirjîn/**: ☜ **ڤەپرژیان**

**ڤـە پـرس / vepirs/**: نـاو. باسـکۆڵ؛ بـازپرس. هەروەها: **ڤەپرسی** 🇮🇷 بازپرس

**ڤە پرسین / vepirsîn/**: چاوگ. پرسـینەوە؛ پرسـیار لێ کردن 🇮🇷 بازخواست کردن

**ڤە پرتکان / vepiřt(i)kan/**: چاوگ. تێک‌شکان؛ لە بەر یەک چوون 🇮🇷 درهم شکستن

**ڤە پرتکاندن / vepiřt(i)kandin/**: چـاوگ. تێک‌شکاندن؛ لە بەر یەک بردن 🇮🇷 درهم شکستن

**ڤە پرتکیای / vepiřtikyay/**: ئاوەڵناو. تێک‌شکاو؛ لە بەر یەک چوو 🇮🇷 درهم شکسته

**ڤە پریتاندن / vep(i)řîtandin/**: ☜ **ڤەپلیتاندن**

**ڤە پژکاندن / vepijkandin/**: چـاوگ. خـۆ راوەشاندن؛ خۆ تەکانن 🇮🇷 خود را تکانیدن

**ڤە پژلان / vepijlan/**: چـاوگ. سـوور و پـێ‌داگـر بوون لە سەر مەبەست 🇮🇷 مُصر بودن

**ڤە پژلاندن / vepijlandin/**: چاوگ. سوور بـوون و پێ‌داگرتن 🇮🇷 پافشاری کردن

**ڤە پسکان / vepiskan/**: چـاوگ. ڤەپسـکیان؛ ڤەپسکین؛ کەوی بوون؛ هاتنە ژێر فـەرمان 🇮🇷 رام شدن

**ڤە پسکاندن / vepiskandin/**: چاوگ. هێنانـە ژێـر فەرمان؛ کەوی کردن 🇮🇷 رام کردن

**ڤە پسکیان / vepisk(i)yan/**: ☜ **ڤەپسکان**

**ڤە پسکین / vepiskîn/**: ☜ **ڤەپسکان**

**ڤە پلیتان / vep(i)lîtan/**: چاوگ. تونـد بـە زەویـدا کەوتن 🇮🇷 سخت بر زمین افتادن

**ڤە پلیتاندن / vep(i)lîtandin/**: چـاوگ. ڤەپریتاندن؛ توند بە زەویدا کوتـان 🇮🇷 سـخت بـر زمین زدن

**ڤە پوورسین / vepûrsîn/**: چـاوگ. بوورانـەوە؛ لەسەرخۆ چوون 🇮🇷 از هوش رفتن

**ڤە پوون / vepûn/**: چاوگ. ورد بـوونی شـتی زۆر رەق ‹کەڤرێ مـەزن ڤـەپوو› 🇮🇷 خُرد شـدن جسم سخت

**ڤە پەران / vepeřan/**: ☜ **ڤەپەڕین**

**ڤە پەراندن / vepeřandin/**: چـاوگ. پەڕاندنـەوە؛ تێپەڕاندن 🇮🇷 عبور دادن

**ڤە پەڕتان / vepeřtan/**: چـاوگ. شـڕ و وڕ بـوون؛

بزگوڕ- بزگوڕ بوون ≅ پاره شدن

**ڤەپەڕتاندن** / vepeřtandin/: چاوگ. دڕاندن؛ شڕ کردن ≅ پاره کردن

**ڤەپەڕیان** / vepeřyan/: ☜ **ڤەپەڕین**

**ڤەپەڕین** / vepeřîn/: چاوگ. ڤەپەڕان؛ ڤەپەڕیان؛ پەڕانەوه؛ پەڕینەوه؛ تێپەڕین ≅ عبور کردن

**ڤەپەژکاندن** / vepejkandin/: چاوگ. ڕاوەشاندن؛ تەکاندن ≅ تکان دادن

**ڤەپەنگزین** / vepeng(i)zîn/: چاوگ. قنج بوونەوه؛ قیتەوه بوون ≅ برآمدن

**ڤەپیان** / vepyan/: ☜ **ڤەپین**

**ڤەپیرین** / vepîrîn/: چاوگ. بڕینەوەی سەودا و مامەڵە ≅ تمام کردن مُعامله

**ڤەپین** / vepîn/: چاوگ. ڤەپیان؛ شێلان ≅ چلاندن

**ڤەپێچاندن** / vepêçandin/: چاوگ. ١. کردنەوەی گرێ ٢. لە کرژی خاو کردنەوه ٣. *[مەجاز]* لێپرسینەوه و بەسەرکردنەوه ≅ ١. باز کردن گره ٢. تابیده را خام کردن ٣. دلنوایی کردن

**ڤەپێچرین** / vepêçrîn/: چاوگ. تێگەیاندن؛ حاڵی کردن ≅ فهماندن

**ڤەتراندن** / vetrandin/: چاوگ. باوێشک دان و خۆ کێشانەوه لە بەر خەو هاتن ≅ از خستگی خمیازه کشیدن و عضلات را جمع کردن

**ڤەترسین** / vetirsîn/: چاوگ. چا بوونەوه لە نەخۆشی ≅ شفا یافتن

**ڤەترکان** / vetirkan/: چاوگ. ١. پێکرانی نیشانه ٢.ترووکانی پەلکی چاو ≅ ١. به هدف خوردن ٢. جهیدن پلک چشم

**ڤەترکاندن** / vetirkandin/: چاوگ. ١. لە ئامانج دان؛ پێکانی نیشان ٢. ترووکاندنی چاو ≅ ١. به هدف زدن ٢. پلک برهم زدن

**ڤەتروویسکاندن** / vet(i)rûyskandin/: ☜ **ڤەتریسکاندن**

**ڤەترویسکیان** / vet(i)rûysk(i)yan/: ☜ **ڤەتریسکان**

**ڤەترووسکین** / vet(i)rûyskîn/: ☜ **ڤەتریسکان**

**ڤەتریسکان** / vet(i)rîskan/: چاوگ. ڤەترووویسکیان؛ ڤەتروویسکین: ١. دەرپەڕین؛ تەره بوون ٢. لە بەر چاو گوم بوون ≅ ١. رم کردن ٢. ناپدید شدن

**ڤەتریسکاندن** / vet(i)rîskandin/: چاوگ. ڤەترووویسکاندن؛ دەرپەڕاندن ≅ رم دادن

**ڤەتڕاندن** / vet(i)řandin/: چاوگ. ڕۆکەوتن؛ شان داهێلان؛ پاڵ دانەوه و ڕاکشان لە سەر زەوی ≅ لَم دادن

**ڤەتڕسین** / vetiřsîn/: چاوگ. تازه لە نەخۆشی هەستانەوه ≅ تازه شفا یافتن

**ڤەتەران** / veteran/: ئاوەڵناو. ١. جەنگی؛ شەڕڤان ٢. شارەزا؛ لەکارزان؛ کارکوشته ≅ ١. جنگجو ٢. کاردان

**ڤەتەڕستین** / veteřistîn/: چاوگ. چاک بوونەوه؛ خوەشەو بوون؛ لە نەخۆشی هەستانەوه ≅ شفا یافتن

**ڤەتەقیان** / veteqyan/: چاوگ. لێک بڕان؛ جیا بوونەوه ≅ جدا شدن

**ڤەتەکان** / vetekan/: چاوگ. تەکان؛ تەکێنران؛ ڕاوەشێنران ≅ تکانده شدن

**ڤەتەکاندن** / vetekandin/: چاوگ. تەکاندن؛ شەکاندن؛ ڕاوەشاندن؛ ڕاتەکاندن ≅ تکاندن

**ڤەتەمران** / vetemran/: چاوگ. ڤەتەمریان؛ ڤەتەمرین: ١. کوژانەوه؛ داکوژانی ئاگر ٢. *[مەجاز]* ساردەوه بوون؛ مردن ≅ ١. خاموش شدن آتش ٢. مُردن

**ڤەتەمراندن** / vetemrandin/: چاوگ. ١. کوژاندنەوەی ئاور ٢. *[مەجاز]* مراندنی کەسێ ≅

١. خاموش کردن آتش ٢. کسی را کُشتن
**ڤەتەمریان** / vetemiryan/: ☜ **ڤەتەمران**
**ڤەتەمرین** / vetemrîn/: ☜ **ڤەتەمران**
**ڤەتەوشین** / vetewşîn/: چاوگ. واق ورمان؛ سەرسام مان ✉ مُتحیر شدن
**ڤەتیرە** / vetîre/: ناو. رووداو؛ بارودۆخێکی کتوپڕی و زۆرتر ناخۆش ✉ حادثه
**ڤەجنقان** / vecinqan/: ☜ **ڤەجنکان**
**ڤەجنقاندن** / vecinqandin/: چاوگ. ڕاچەناندن؛ ڕاچڵەکاندن ✉ شُکه کردن از ترس
**ڤەجنقیان** / vecinq(i)yan/: ☜ **ڤەجنکان**
**ڤەجنقین** / vecinqîn/: ☜ **ڤەجنکان**
**ڤەجنکان** / vecinkan/: چاوگ. ڤەجنقان؛ ڤەجنقیان؛ ڤەجنقین؛ ڕاچەنین لە ترسان ✉ یکّه خوردن از ترس
**ڤەجووین** / vecuwîn/: چاوگ. ١. جوونەوەی بنێشت ٢. *[کنایی]* چەندپاتە کردنەوەی قسە ✉ ١. جویدن سقز ٢. تکرار کردن چندبارەی سخن
**ڤەجەماندن** / vecemandin/: چاوگ. کۆکردنەوە؛ جڤات چێکرن ✉ جمع کردن
**ڤەجەمیان** / vecemyan/: ☜ **ڤەجەمین**
**ڤەجەمین** / vecemîn/: چاوگ. ڤەجەمیان؛ کۆبوونەوە؛ جەم بوونەوە ✉ جمع شدن
**ڤەجین** / vecîn/: ناو. کاوێژ ✉ نشخوار
**ڤەچاشاندن** / veçaşandin/: چاوگ. چێژە کردن؛ تام کردن بۆ ئەزموون ✉ چشیدن
**ڤەچراندن** / veç(i)řandin/: چاوگ. شی کردنەوەی کوڵکە؛ لە بەر یەک هەڵوەشاندنی خوری و پەموو ✉ از هم باز کردن پشم و پنبه
**ڤەچرین** / veç(i)řîn/: چاوگ. ١. هەڵپچرین؛ بە زۆر لێ‌کردنەوە ٢. ڕاکێشان بە زەویدا ✉ ١. برکندن ٢. بر زمین کشیدن
**ڤەچفاندن** / veç(i)fandin/: چاوگ. ١. سەرکۆنە کردن ٢. دەرکردن؛ وە دەر نان ✉ ١. سرزنش کردن ٢. بیرون کردن
**ڤەچفیان** / veçifyan/: چاوگ. ١. لۆمە کران؛ سەرکۆنە کران ٢. دەرکران؛ وە دەر نران ٣. سەر داخستن لە شەرمەزاری ✉ ١. سرزنش شدن ٢. اخراج شدن ٣. سرِ شرم پایین انداختن
**ڤەچکیان** / veçikyan/: چاوگ. ١. داچکان؛ هەڵچۆڕان ٢. دالەقان؛ تەکەتەک کردنی هەڵواسراو ✉ ١. چکیدن ٢. آویزان حرکت کردن
**ڤەچناندن** / veç(i)nandin/: چاوگ. چنینەوەی شتی دڕاو ✉ رفو کردن
**ڤەچنین** / veç(i)nîn/: چاوگ. ١. چنینەوە؛ دوورینەوە؛ وەچناندن ٢. *[مەجاز]* دوورەپەرێزی کردن؛ خۆ کێشانەوە لە کارێ ✉ ١. رفو کردن ٢. خود را کنار کشیدن
**ڤەچۆڕان** / veçořan/: چاوگ. چۆڕانەوە؛ تکان ✉ چکیدن
**ڤەچۆڕاندن** / veçořandin/: چاوگ. هەڵچۆڕاندن؛ تکاندن ✉ چکانیدن
**ڤەچەمان** / veçeman/: چاوگ. ڤەچەمیان؛ چەمینەوە ✉ خم شدن
**ڤەچەماندن** / veçemandin/: چاوگ. چەماندنەوە ✉ خم کردن
**ڤەچەمیان** / veçemyan/: ☜ **ڤەچەمان**
**ڤەچەمیاندن** / veçemyandin/: چاوگ. ١. چنینەوە؛ هەڵگرتنەوەی ورد لە زەوی ٢. هەڵکردنی باسک و دەلینگ ✉ ١. ورچیدن ٢. آستین و پاچه را بالا زدن
**ڤەحەواندن** / veĥewandin/: چاوگ. ١. حاواندنەوە؛ چاودێری کردن ٢. پەنا دان ✉ ١. سرپرستی کردن ٢. پناه دادن
**ڤەخاپاندن** / vexapandin/: چاوگ. فریو دانەوە ✉ فریب دادن

**ڤەخارن**[1] / vexarin/: چاوگ. ڤەخوارن؛ خواردنەوە؛ نۆشین ‹مە ژ لەعلێ لەبێ یارێ ڤەخار ئاڤێ حەیات/ ئەغیار بلا تێکی بچن دارینێ «مەلای جزیری»› ☰ نوشیدن؛ آشامیدن

**ڤەخارن**[2]: ناو. خواردنەوەیی؛ شتی بۆ خواردنەوە؛ نووشابە ☰ نوشیدنی؛ آشامیدنی

**ڤەخاندن** / vexandin/: چاوگ. خوێندنەوە ‹تە ئەڤ نامە ڤەخاندییە؟› ☰ خواندن

**ڤەخاندی** / vexandî/: ناوەڵناو. ڤەخواندی: ١. بانگ‌کراو ٢. خوێندراوەوە ‹ئەڤ نامەی ڤەخاندی ژ تەڕایە؟› ☰ ١. دعوت شده ٢. خوانده شده

**ڤەخراندن** / vex(i)řandin/: چاوگ. بە سانایی پێک‌هێنان ☰ آسان انجام دادن

**ڤەخلیسکان** / vex(i)lîskan/: چاوگ. خلیسکان؛ هەڵخلیسکان؛ خزیان ☰ لیز خوردن

**ڤەخلیسکاندن** / vex(i)lîskandin/: چاوگ. خلیسکاندن؛ خزاندن ☰ لیز دادن

**ڤەخوارن** / vex(i)warin/: ☜ **ڤەخارن**[1]

**ڤەخوازتن** / vexwaztin/: چاوگ. ویستن؛ گەرەک بوون ‹دا مونتەقمێ قادرێ قەیبووم ڤەخوازت/ دادا مە ژ کوففار و ژ فوججار بوغاتان «خانی»› ☰ خواستن

**ڤەخواندن** / vex(i)wandin/: چاوگ. ١. بانگ کردن ٢. خوێندنەوەی نووسراو ☰ ١. دعوت کردن ٢. خواندن

**ڤەخواندی** / vex(i)wandî/: ☜ **ڤەخاندی**

**ڤەخوران** / vexuran/: چاوگ. خوران: ١. خورانەوە؛ خوریانەوە ‹ژ لەعلێ د یارێ ئەمن مەی ڤەخوارا/ ب دل من دبەخشی بەدەخشان، بوخارا «خانی»› ٢. ئالۆش لێ پەیدا بوون ☰ ١. نوشیدە شدن ٢. خاریدن

**ڤەخوراندن** / vexurandin/: چاوگ. ١. خوراندنی ئالۆش ٢. *[مەجاز]* بە قسەی خۆش و هێمنی دەگەڵ کەسێ ڕەفتار کردن ☰ ١. خاراندن ٢. با مدارا با کسی رفتار کردن

**ڤەخومان** / vexuman/: چاوگ. ڤەخومین؛ تێکەوە گلان؛ تێکەڵ ـ پێکەڵ بوون ☰ مخلوط شدن

**ڤەخوماندن** / vexumandin/: چاوگ. تێکەوە گلاندن؛ تێکەڵ ـ پێکەڵ کردن ☰ مخلوط کردن

**ڤەخومین** / vexumîn/: ☜ **ڤەخومان**

**ڤەخوەندن** / vex(i)wendin/: چاوگ. قاو کردن؛ بانگ کردن ☰ دعوت کردن

**ـ ڤەخۆر** / vexor-/: پاشگر. خۆرەوە ‹بادە ڤەخۆر› ☰ ـ نوش

**ڤەخۆراندن** / vexorandin/: چاوگ. پێ خۆراندن؛ دەرخوارد دانی تراو ☰ وادار به نوشیدن کردن

**ڤەخۆستن** / vexostin/: چاوگ. ١. بانگ کردنی کەسێک ٢. بە ئامانەت وەرگرتن ☰ ١. کسی را خواستن ٢. امانت گرفتن

**ڤەخۆگرتی** / vexogirtî/: ناوەڵناو. بەرعۆدە؛ وەئەستۆگر؛ دەستەبەر ☰ مُتعهد

**ڤەخۆندن** / vexondin/: چاوگ. ١. خوێندنەوەی نووسراو بۆ گوێگر/ گوێگران ٢. دڵدانەوە؛ دڵداری دانەوە ٣. بانگ کردن؛ قاو کردن ☰ ١. خواندن نوشته برای شنونده/ شنوندگان ٢. دلخوشی دادن ٣. دعوت کردن

**ڤەخەپراندن** / vexeprandin/: چاوگ. ئاگر خۆش کردن؛ دەست دە ئاگر وەردان بۆ گەش کردنەوەی ☰ زیر و رو کردن آتش برای شعله‌ورتر کردن آن

**ڤەدان** / vedan/: چاوگ. ١. هەڵماسان؛ پەنەمانی زگ ٢. زەوی کۆڵین؛ دانەوەی زەوی ٣. دانەوەی وام ٤. هەناسەدان؛ پشوو کێشان ٥. بە تەندوورەوە دان (نان و ...) ٦. پێوەدان (مار و دووپشک و...) ٧. هەڵدان (چادر و..) ‹بێ خەیمە و بارەگاهێ ئەیوان/ عەوران ڤەددا ل سەر وی سەیوان «خانی»› ٨. برینگاندن؛ وێستانەوە (باران و ...)

٩. داهێنــان؛ بــەدیهێنان ١٠. *[مەجاز]* پشــوودان؛ حەسانەوە ‹حکوومەت ڕۆژێن بهێن ڤەدان بو جـەژنا رەمەزانێ ڕاگەهاندن› ١١. دانــەوە ‹ڕەنـگ ڤـەدان؛ دەنگ ڤەدان› ﷼ ١. آماسیدن شکم ٢. کندن زمین ٣. پس دادن وام ۴. نفس کشیدن ۵. به تنور زدن (نـان و ...) ۶. نیش زدن (مار و...) ٧. برپا کردن (چادر و ...) ٨. بند آمـدن (بـاران و ...) ٩. پدیـد آوردن ١٠. اسـتراحت کردن ١١. پس دادن

**ڤـەدان‌دەر** / vedander/: نـاو. داهێنــەر؛ خــودا ﷼ خالق؛ خُدا

**ڤەدانین** / vedanîn/: چاوگ. نیشتنەوەی باڵدار ﷼ نشستن پرنده

**ڤەدزین** / ved(i)zîn/: چـاوگ. ١. دزینەوە؛ شت بە کەســێک دان و بــە نهــێنی بردنــەوە ٢. خــۆ شاردنەوە ﷼ ١. بخشیده را دزدیدن ٢. پنهان شدن

**ڤەدەر**[1] / veder/: ئاوەڵناو. جیاواز؛ وەلا نـراو؛ وەدەر ‹هندەک پەرژ گارانێ ڤەدەر بوو› ﷼ جُدا

**ڤەدەر**[2]: ئامراز. جگە؛ بێجگە ﷼ بجُز؛ بغیر از

**ڤـەدیتن** / vedîtin/: چـاوگ. دیتنــــەوە: ١. دۆزینەوەی گومبوو ‹بهێزترین بەلگـە ل مێژوویـێ، پەیکـەرەکی مرۆڤـێ هاتییـە ڤـەدیتن› ٢. بەسـەر کردنــەوە ٣. بــۆ دیــدار چوونــەوە ‹ئامـادە کرنـا ترۆمبێلێ ژ بۆ ڤەدیتن› ﷼ ١. گم شده را پیدا کـردن ٢. نواختن ٣. بازدید کردن

**ڤـەدین** / vedîn/: چـاوگ. دۆزینـەوەی گـومبـوو ‹دیرۆکێ ڤەگەرین و رووپەلێن دیرۆکـێ ڤـەدین› ﷼ بازیافتن

**ڤـەدێران** / vedêran/: چـاوگ. ١. دەنگــۆ بــلاو بوونەوە ٢. بڵاو کردنەوەی قسە ﷼ ١. شایع شـدن ٢. پخش کردن خبر

**ڤەر**[1] / ver/: ناو. ١. بان؛ سەروو؛ بالا ٢. ئالی؛ لا ٣. دەرێ دەرەوە ﷼ ١. بالا ٢. طرف؛ سو ٣. بیرون؛ خارج

**ڤەر**[2]: ئاوەڵکار. دەر؛ دەرەوە ﷼ بیرون؛ خارج

▣ **ڤەر کرن**: ١. بلاو کردن ‹مـۆرێ ب ئـەردێ ڤـەر کرن› ٢. پژاندن ‹خوێ ب زەلا تەیێ ڤـەر کـە!› ﷼ ١. پخش کردن ٢. پاشیدن

**ڤەر**[3]: پێشگر. وەر- ‹ڤەرکەتن› ﷼ وا-

**ڤەراڤەر** / veraver/: ئاوەڵناو. بەرانبەر ﷼ برابر

**ڤــەراکرن** / verak(i)rin/: چــاوگ. وەشــــارتن؛ شاردنەوە ﷼ پنهان کردن

**ڤەراندن** / verandin/: چاوگ. سواندن بە مرەمەند؛ لە بربەند دان ﷼ سوهان زدن

**ڤەرچالە** / verçale/: ☜ **ڤرچالە**

**ڤەرچیناندن** / verçînandin/: چاوگ. چنینەوە لـە زەمین ﷼ برچیدن

**ڤەرساندن** / versandin/: چاوگ. ١. دڕاندن؛ دڕین ٢. شکاندن؛ شکانن ﷼ ١. پاره کردن ٢. شکستن

**ڤەرستن** / veristin/: چـاوگ. ڤەرسـین: ١. دڕان؛ دڕیان ٢. شـکان؛ شـکیان ٣. *[مەجاز]* بـەر بـوون ‹کەر ڤەبستن، خـەم ڤەرسـتن «پەنـد»› ﷼ ١. پـاره شُدن ٢. شکستن ٣. رها شدن

**ڤەرســــــتیای** / verist(i)yay/: چــــــــاوگ. هەڵوەشاندنەوە؛ لێک کردنەوە ﷼ باز کردن؛ از هـم وا کردن

**ڤەرسهاندن** / vers(i)handin/: چاوگ. پشـوو پـێ دان ﷼ استراحت دادن

**ڤەرسین** / versîn/: چاوگ. ١. ☜ **ڤەرستن** ٢. دوا کەوتن؛ درەنگ مان ﷼ ١. ☜ **ڤەرستن** ٢. عقـب افتادن

**ڤەرشـاندن** / verşandin/: چـاوگ. ڤەریشـــاندن؛ ڤەریســـاندن؛ ڤەرەســـاندن؛ ڤەرەشـــاندن؛ هەڵهاوردنەوە ﷼ بالا کردن

**ڤەرشە** / verşe/: ☜ **وەرشەو**

**ڤەرشین** / verşîn/: چـاوگ. ڕشـانەوە ﷼ اسـتفراغ کردن

**ڤەرڤە** / verve/: ☜ **ڤەور**

**ڤەرق** / verq/: ☜ **ڤەڕك**

**ڤەرقل** / verqil/: ئاوەڵناو. گەللایی؛ گوێنەدەر بە کار ☰ بی‌مُبالات

**ڤەرقلین** / verq(i)lîn/: چاوگ. خۆ بواردن و تەمەڵی کردن لە کار ☰ تن بە کار ندادن

**ڤەرك** / verk/: ☜ **گورگ**

**ڤەرگرتن** / vergirtin/: چاوگ. ١. گرتنەوەی نەخۆشینی گیرۆ ٢. وەرگرتن ‹ئازاد قەت وا هزر نەدکر کو وسا ب گەرمی بێتە ڤەرگرتن و ببە مامۆستا› ☰ ١. مُبتلا شدن ٢. پذیرفته شدن

**ڤەرگەڕ** / vergeř/: ناو. ١. ڕەوتی وەرگەڕان؛ پێچ خواردن ٢. کاری گەڕانەوە؛ هەڵەوگەڕیان ٣. پەژیوانی؛ پەشیمانی ☰ ١. پیچش ٢. بازگشت ٣. پشیمانی

**ڤەرگهاندن** / verg(i)handin/: چاوگ. ١. لێک جیا کردنەوە ٢. کردنەوەی گرێ ☰ ١. از هم جدا کردن ٢. باز کردن گره

**ڤەرمل** / vermil/: ئاوەڵناو. ماندوو؛ شەکەت ☰ خسته

**ڤەرملین** / verm(i)lîn/: چاوگ. شەکەت بوون؛ فل بوون ☰ بسیار خسته شدن

**ڤەرۆتن** / verotin/: چاوگ. ١. لابردن؛ لە سەر هەلگرتن ٢. داگرتن؛ هێنانە خوار ٣. کرانەدن؛ کرۆژتن ☰ ١. برداشتن ٢. پایین آوردن ٣. برکندن

**ڤەرۆژی** / verojî/: ناو. کار و پیشەی هەڵکۆڵین؛ کەندەکاری ☰ حکّاکی

**ڤەرووێتاندن** / verûytandin/: ☜ **ڤەڕوتاندن**

**ڤەرووێچاندن** / verûyçandin/: ☜ **ڤەڕوتاندن**

**ڤەرەساندن** / veresandin/: ☜ **ڤەرشاندن**

**ڤەرەسین** / veresîn/: چاوگ. تێکچوون؛ لە بەر یەک بوون ☰ از هم پاشیدن

**ڤەرەشاندن** / vereşandin/: ☜ **ڤەرشاندن**

**ڤەرەشی** / vereşî/: ناو. قەی؛ ڕشاوە؛ ئەوەی لە ڕشانەوە دێتە دەر ‹ڤەرەشیا زارۆکێ جلێ من لەوتاند› ☰ استفراغ؛ قی

**ڤەریچاندن** / verîçandin/: ☜ **ڤەڕوتاندن**

**ڤەریچکاندن** / verîçkandin/: چاوگ. ڕووتاندنەوە؛ موو، تووک یان پەڕ لێ کردنەوە ‹مە ژبۆ فراڤێنی مریشکەک سەر ژێ کر و ل بەر دەرێ ڤەریچکاند› ☰ مو، کُرک و یا پر کندن

**ڤەریس** / verîs/: ناو. ١. گورێس؛ گوریس؛ پەت ٢. ڕوونووس ☰ ١. رسن؛ ریسمان ٢. رونویس

**ڤەریساندن** / verîsandin/: ☜ **ڤەرشاندن**

**ڤەریستن** / verîstin/: چاوگ. قەد کردن؛ بە سەر یەکا هێنانەوە ☰ تا کردن

**ڤەریسین** / verîsîn/: چاوگ. ١. ڕستنەوە؛ دیسانەوە ڕستن ٢. بەر دان؛ ئازاد کردن ☰ ١. دوباره رسیدن (بازرسیدن) ٢. رها کردن

**ڤەریشاندن** / verîşandin/: ☜ **ڤەرشاندن**

**ڤەرێتن** / verêtin/: چاوگ. ١. ڕژاندن ٢. وەراندن ☰ ١و٢. ریختن

**ڤەرێز** / verêz/: ناو. پەرێز؛ جارەگەنمی دووراوە ☰ مزرعەی دروشدەی گندم

**ڤەرێژ** / verêj/: ناو. ناوەڕۆکی کتێب و نووسراو ☰ مُحتوای نوشته

**ڤەرێن** / verên/: ئاوەڵناو. ١. پێشین ٢. سەرەتایی ☰ ١. پیشین ٢. آغازین

**ڤەڕ** / veř/: ناو. بەفر ☰ برف

**ڤەڕسان** / veřsan/: ☜ **ڤەڕستن**

**ڤەڕساندن** / veřsandin/: چاوگ. ١. ڕاپسکاندن؛ ڕفاندن؛ قۆزتنەوە ٢. ڕزگار کردن ☰ ١. ربودن ٢. رها کردن

**ڤەڕستن** / veřistin/: چاوگ. ڤەرسین؛ ڤەڕسان: ١. ڕاپسکان؛ لەپڕ جیا بوونەوە ‹ئەز ژ زولفا تە ڤەرستم مە تەلەب کر لەبێ لەعل/ لێ د چاها زەقەنێ بێ‌سەروپا چوومە هەلەک «مەلای جزیری»› ٢.

ڕزگار بوون ‹مە سەراپەردەیێ حوورانە مەقام / ژ سیا زولفێ بتان ئەر ڤەرسین «مـەلای جزیـری»› ⯐ ١. جدا شدن ٢. رها شدن

**ڤەڕشان** / veřşan/: چاوگ. ڤەڕشیان؛ ڤەڕشین؛ ڤەڕەشان؛ ڤەڕەشیان؛ ڕەشانەوە ⯐ قی کردن؛ بـالا آوردن

**ڤەڕشاندن** / veřşandin/: چاوگ. ١. ڤەڕەشـاندن؛ پێ ڕشاندنەوە ٢. /مەجاز/ پێبژاردن ⯐ ١. وادار بـە استفراغ کردن ٢. تاوان گرفتن

**ڤەڕشیان** / veřişyan/: ☜ **ڤەڕشان**

**ڤەڕشین** / veřişîn/: ☜ **ڤەڕشان**

**ڤەڕک** / veřk/: ناو. ڤەرق؛ شـینۆ؛ گـورگ؛ گـور ⯐ گرگ

**ڤەڕمل** / veřmil/: ناوەڵناو. فل؛ شەکەت؛ زۆر ماندوو ⯐ بسیار خسته

**ڤـەڕنـین** / veřinîn/: چـاوگ. ١. بــە دەســت ڕنینـەوەی تـووک ٢. بـە دەسـت هەڵـکەندن و دروونی خەلە ⯐ ١. با دست چیدن مو ٢. بـا دسـت درویدن غلّه

**ڤـەڕووتـان** / veřûtan/: چـاوگ. ڤـەڕووتن؛ ڤەڕووچکان: ١. ئـاوەڕووت بـوون ٢. ڕووتیانـەوە (دار و...) ٣. کڕووسیانەوە؛ دارنـرانی گۆشـت لـە ئێسک ⯐ ١. پرکنده شدن ٢. لُخت شـدن (درخـت و ...) ٣. لُخت شدن استخوان

**ڤەڕووتاندن** / veřûtandin/: چاوگ. ڤەڕووچکاندن؛ ڤـەڕوویتاندن؛ ڤـەڕوویچاندن؛ ڤـەریچاندن: ١. ئـاوەڕووت کـردن ٢. دارنـین (دار و ...) ٣. کڕۆساندنەوە؛ دارنینی گۆشت لـە ئێسـک ⯐ ١. پرکنـدن ٢. لُخـت کـردن (درخـت و ...) ٣. برکنـدن (گوشت از استخوان)

**ڤەڕووتن** / veřûtin/: ☜ **ڤەڕووتان**

**ڤەڕووتی** / veřûtî/: ناوەڵناو. ڕووتاوەوە (لە موو، گـەڵا یان گۆشت) ⯐ لُخت شده (از مو، برگ، یا گوشت)

**ڤەڕووچکان** / veřûçkan/: ☜ **ڤەڕووتان**

**ڤەڕووچکاندن** / veřûçkandin/: ☜ **ڤەڕووتاندن**

**ڤەڕەستی** / veřestî/: ناو. ڕزگاری ⯐ رستگاری

**ڤەڕەشان** / veřeşan/: ☜ **ڤەڕشان**

**ڤەڕەشـاندن** / veřeşandin/: چاوگ. ڤەڕشاندن؛ پێ ڕشاندنەوە ⯐ به استفراغ واداشتن

**ڤەڕەشیان** / veřeşyan/: ☜ **ڤەڕشان**

**ڤەڕەڤین** / veřevîn/: چـاوگ. ڕەو کـردن؛ بـڵاوە کردن؛ هـەڵاتنی بەکۆمـەڵ ⯐ دسـتەجمعـی فـرار کردن

**ڤەڕێتن** / veřêtin/: چاوگ. ڕژانـدن؛ بـەرەو خـوار بەردانەوە ⯐ ریختن

**ڤـەز** / vez/: نـاو. ١. بـەز؛ پـی؛ دووگ ٢. جـار؛ کەڕەت ⯐ ١. پیه ٢. بار

**ڤـەزان** / vezan/: چـاوگ. ١. زانـەوەی کـانی ٢. دیسانەوە بێچوو هێنان ⯐ ١. باز زاییـدن چشـمه ٢. دوباره بچه آوردن

**ڤەزخت** / vezixt/: ناوەڵناو. چلکن؛ گەمار؛ نەخاوێن ⯐ آلوده؛ کثیف

**ڤەزختاندن** / vezixtandin/: چاوگ. پیس و پۆخڵ کردن ⯐ آلودن؛ کثیف کردن

**ڤەزڤران** / vezivřan/: ☜ **ڤەزڤرین**

**ڤەزڤرانـدن** / vezivřandin/: چاوگ. گەڕاندنەوە ⯐ بازگرداندن

**ڤەزڤریان** / veziviřyan/: چاوگ. ١. ☜ **ڤەزڤرین** ٢. پاشگەز بوونەوە ⯐ ١. ☜ **ڤەزڤرین** ٢. پشیمان شدن

**ڤەزڤرین** / vezivřîn/: چاوگ. ڤەزڤران؛ ڤەزڤـریان؛ زڤرین؛ گەڕانەوە ⯐ بازگشتن

**ڤەزکین** / vezkîn/: چاوگ. هەڵقوڵـین؛ بـە نهـێم دەرچوونی تراو لە شوێنێکەوە ⯐ جوشیدن؛ فـوران کردن

**ڤەزلانـدن** / vezlandin/: چـاوگ. تلانـدن؛ تلانـن؛

تلاندنەوە ▣ غلتاندن

**ڤەزۆقان** / vezoqan/: چاوگ. بۆق پێوە نران؛ دەڵەک دران؛ پاڵ پێوە دران ▣ تنه خوردن

**ڤەزۆقاندن** / vezoqandin/: چاوگ. پاڵ پێوە نان؛ دەڵەک دان ▣ هول دادن

**ڤەزەلان** / vezelan/: چاوگ. ١. گەوزین؛ درێژ بوونەوە و خۆ تلاندنەوە ٢. تووڕ دران؛ پەرت دران ▣ ١. دراز کشیدن و غلت زدن ٢. پرت شدن

**ڤەزەلاندن** / vezelandin/: چاوگ. ١. گەوزاندن؛ تل پێ دان ٢. تووڕدان؛ فڕە دان ٣. بە سەر شتێکدا ڕاکشان ▣ ١. غلتاندن ٢. پرت کردن ٣. روی چیزی دراز کشیدن

**ڤەزەلین** / vezelîn/: چاوگ. ١. خلیسکان و کەوتن ٢. خۆ درێژ کردن و گەوزین ▣ ١. لیز خوردن و افتادن ٢. دراز کشیدن و غلتیدن

**ڤەزیخاندن** / vezîxandin/: چاوگ. دنە دان؛ هان دان؛ ناو تێدان؛ زیخ کردن بە قسە ▣ تشجیع کردن

**ڤەزین** / vezîn/: چاوگ. فوو کردن؛ پف کردن؛ با لە دەم دەرخستن ▣ فوت کردن

**ڤەژارتن** / vejartin/: چاوگ. بژارتن؛ جیاکردنەوە؛ هەڵوەژێران ▣ جُدا کردن؛ سوا کردن

**ڤەژاندن** / vejandin/: چاوگ. ١. بووژاندنەوە؛ لە پاش کەنەفتی، ساز و دڵخۆش کردن ‹نەخمێ وە ژ پەردەیێ دەرینم/ زینێ ئەوو مەمێ ژ نوو ڤەژینم «خانی»› ٢. هەلاجی کردن؛ شی کردنەوەی شتی وەک کوڵکە بە کوتک و کەوان ▣ ١. سر حال آوردن ٢. حلاجی کردن

**ڤەژۆ** / vejo/: ☜ ڤاژی

**ڤەژەن** / vejen/: ناو. ١. تین؛ هالاوی گەرما ٢. برووسکە؛ پریشکەی ئاگر ٣. هێز؛ وزە؛ ئینرجی ‹ئاژانسا ڤەژەنا ئەتۆمی› ▣ ١. هُرم ٢. شراره ٣. انرژی؛ توان

**ڤەژەندن** / vejendin/: چاوگ. شی کردنەوەی شتی وەک خوری و کوڵکە بە دەست ▣ حلاجی پشم و پنبه با دست

**ڤەژەنین** / vejenîn/: ☜ ژەندن

**ڤەژیان** / vej(i)yan/: چاوگ. ڤەژین؛ زیندوو بوونەوە ‹ژ ڕەمزا دلبەرێ دیسا/ ل من باتین ڤەژین دەردە «مەلای جزیری»› ▣ زنده شدن

**ڤەژیاندن** / vej(i)yandin/: چاوگ. ژیاندنەوە؛ زیندوو کردنەوە ▣ زنده کردن

**ڤەژین** / vejîn/: ☜ ڤەژیان

**ڤەژینک**[1] / vejînik/: ناو. ڕەوتی ژیانەوە ▣ احیا

**ڤەژینک**[2]: ئاوەڵناو. هۆی بووژانەوە ▣ حیات‌بخش

**ڤەس** / ves/: ئاوەڵکار. بەس؛ وەس؛ هند ▣ بس

**ڤەستا** / vesta/: ناو. ئوسا؛ ئوستا؛ وەستا ▣ اُستادکار

**ڤەستان** / vestan/: چاوگ. ١. ڕاوەستان؛ وێسیان ٢. دەس کێشان؛ لە کار بەس کردن ▣ ١. ایستادن ٢. دست از کار کشیدن

**ڤەستاندن** / vestandin/: چاوگ. ١. ڕاگرتنی کار؛ پێش لە بەرێوەچوونی کارێ گرتن ٢. ڕاگرتن؛ بەرگرتن ٣. شەکەت کردن؛ ماندوو کردن ٤. بەرز کردنەوە؛ بڵند کردن ▣ ١. متوقف کردن کار ٢. نگه داشتن ٣. خسته کردن ۴. بلند کردن

**ڤەستران** / vesitran/: چاوگ. لێکدران؛ تێکەڵ کران ▣ آمیخته شدن

**ڤەستراندن** / vesitrandin/: چاوگ. لێکدان؛ تێکەڵ کردن؛ تەڤلهەڤ کرن ▣ آمیختن

**ڤەستەی** / vestey/: ☜ ڤەسەی

**ڤەسڕین** / ves(i)řîn/: چاوگ. سڕین؛ ئەسترین؛ سڕینەوە ▣ زدودن

**ڤەسنا** / vesna/: ناو. خواست؛ ئیرادە ▣ اراده

**ڤەسەی** / vesey/: چاوگ. ڤەستەی؛ بەزین ▣ شکست خوردن

**ڤەسهان**[1] / veshan/: چاوگ. خۆ شاردنەوە ▣ پنهان

شدن

**ڤەسهان**[٢]: ناو. *[مەجاز]* ڕاز؛ نهێنی ☰ راز

**ڤەسهان**[٢]: ئاوەڵناو. شاردراوە؛ شیش کراو؛ شێردراوە ☰ پنهان

**ڤەسهاندن / veshandin/**: چاوگ. ١. شاردنەوە؛ شارنەوە ٢. حەسانەوە؛ هەدا دان؛ ئارام گرتن ☰ ١. پنهان کردن ٢. آسودن

**ڤەسین / vesîn/**: چاوگ. سانەوە؛ حەسانەوە؛ شەکەتی دەرکردن ☰ استراحت کردن

**ڤەشارتن / veşartin/**: چاوگ. شاردنەوە؛ تاقەت کردن ‹من بێ قەدار ئەڤ سیر ڤەشار/ عیشقا غەدار سوهتی ستار «مەلای جزیری»› ☰ پنهان کردن

**ڤەشارتوک / veşartuk/**: ناو. چاوشارەکێ؛ چاوشارکێ ☰ قایم‌موشک

**ڤەشارتو / veşartû/**: ئاوەڵناو. ڤەشارتی؛ ڤەشاردی؛ ڤەشاری؛ ڤەشری؛ ڤەشاردوو؛ شاریاگەوە؛ شاراوە؛ شاردراوە ☰ پنهان شده

**ڤەشارتی / veşartî/**: ☜ ڤەشارتو

**ڤەشاردن / veşardin/**: چاوگ. ڤەشارن؛ ڤەشارتن؛ شاردنەوە ☰ پنهان کردن

**ڤەشاردو / veşardû/**: ☜ ڤەشارتو

**ڤەشاردی / veşardî/**: ☜ ڤەشارتو

**ڤەشارکۆ / veşarko/**: ناو. چاوشارکێ؛ چاوشارەکێ ☰ قایم‌موشک بازی

**ڤەشارن / veşarin/**: ☜ ڤەشاردن

**ڤەشاری / veşarî/**: ☜ ڤەشارتو

**ڤەشاندن / veşandin/**: چاوگ. ١. بەڕێ کردنەوە؛ دیسان ناردن ٢. پرژاندن؛ پژاندن؛ پاشین ‹جەبهەت و دیمێ نەققشاند/ میسک و زەبادێ لێ ڤەشاند «مەلای جزیری»› ☰ ١. بازفرستادن ٢. افشاندن

**ڤەشاندی / veşandî/**: ئاوەڵناو. ١. نارددراو؛ بەڕێ کراو ٢. ڕاسپێراو؛ قەوینتی کراو ☰ ١. فرستاده شده ٢. توصیه شده

**ڤەشتی / vestî/**: ئاوەڵناو. داواکار؛ خوازیار ☰ خواهان

**ڤەشری**[١] **/ veşirî/**: ناو. نهێنی؛ سڕ ☰ راز

**ڤەشری**[٢]: ☜ ڤەشارتو

**ڤەشن / veş(i)n/**: ناو. بەران ☰ قوچ

**ڤەشوشتن / veşuştin/**: چاوگ. ١. شۆردنەوە؛ دیسان شتن ٢. شۆردنەوەی شتی وەک دانەوێڵە ☰ ١. دوباره شُستن ٢. شُستن امثال حبوبات

**ڤەشۆپاندن / veşopandinn/**: چاوگ. دوا کەوتن؛ وە دوو کەوتن ☰ تعقیب کردن؛ دنبال افتادن

**ڤەشەپلان / veşeplan/**: چاوگ. پەشێو بوون؛ بێ‌سەروبەرە بوون ☰ آشُفته شدن

**ڤەشەپلاندن / veşeplandin/**: چاوگ. پەشێو کردن ☰ آشُفته کردن

**ڤەشەقان / veşeqan/**: چاوگ. ڤەشەقیان؛ تەکان خواردن؛ ڕاژان ☰ تکان خوردن

**ڤەشەقاندن / veşeqandin/**: چاوگ. شڵەژاندن؛ تەکان پێ دان ☰ تکان دادن

**ڤەشەقیان / veşeqyan/**: ☜ ڤەشەقان

**ڤەشەلاندن / veşelandin/**: چاوگ. ١. لە بەر داکەندن؛ ڕووت کردنەوە ‹خوە ڤەشەلاند و چوو د ناڤ نڤینێن دەرە› ٢. دەرهێنان ‹تفەنگا خوە ڤەشەلاند و حەشیمەت ڤەهەژاند› ☰ ١. کندن؛ درآوردن ٢. بیرون کشیدن

**ڤەشەمڕان / veşemřan/**: چاوگ. ڤەشەمڕین: ١. ئاوێزران؛ برک دران ٢. شێرانەوە؛ شاریانەوە ☰ ١. انداخته شدن ٢. پنهان شدن

**ڤەشەمڕاندن / veşemřandin/**: چاوگ. ١. خستن؛ هاویشتن ٢. ڤەشارتن؛ شاردنەوە ☰ ١. پرت کردن ٢. پنهان کردن

**ڤەشەمڕین / veşemřîn/**: ☜ ڤەشەمڕان

**ڤەشەهتاندن / veşehtandin/**: چاوگ. هەیلاک

خستن؛ زۆر شەکەت کردن 🇮🇷 از نا انداختن

**ڤەشین** / veşîn/: چاوگ. وەشاندن؛ بڵاو کردنەوە 🇮🇷 افشاندن

**ڤەشێران** / veşêran/: چاوگ. شاردنەوە؛ تاقەت کردن 🇮🇷 پنهان کردن

**ڤەشێلان** / veşêlan/: چاوگ. شێلان 🇮🇷 چلانیدن

**ڤەفر** / vefr/: ناو. پەیمانشکێنی؛ غەدر 🇮🇷 غدر

**ڤەفرژین** / vefirjîn/: چاوگ. هەڵوەشاندن 🇮🇷 از هم گسیختن

**ڤەڤەستان** / vevestan/: چاوگ. وێسیان؛ وێسان؛ وەستانەوە: ١. ڕاوەستان ٢. لە کار وەستان 🇮🇷 ١. بازایستادن ٢. از کار ایستادن

**ڤەڤەستاندن** / vevestandin/: چاوگ. وەستاندنەوە: ١. ڕاوەستاندن؛ وێسانن ٢. لە کار وەستاندن 🇮🇷 ١. متوقف کردن ٢. از کار بازداشتن

**ڤەڤەستای** / vevestay/: ناوەڵناو. ١. وەستاو؛ وێسیاگ؛ ڕاوەستاو بە پێوە ٢. وەستاوە؛ لە کار وێستاو 🇮🇷 ١. ایستاده ٢. بازایستاده

**ڤەقتاندن** / veqitandin/: چاوگ. پێ بڕین؛ دەست پێ هەڵگرتن؛ پەک پێ خستن 🇮🇷 بازداشتن (از ادامەی کار)

**ڤەقوسان** / vequsan/: چاوگ. ١. بڕان؛ بڕیان ٢. تاشران؛ تاشیان (موو) 🇮🇷 ١. بُریده شدن ٢. تراشیده شدن (مو)

**ڤەقوساندن** / vequsandin/: چاوگ. ١. بڕین؛ وڕین؛ قەلت کردن ٢. تراشین؛ تاشین (موو) 🇮🇷 ١. بُریدن ٢. تراشیدن (مو)

**ڤەقەتان** / veqetan/: چاوگ. ڤەقەتیان؛ ڤەقەتین؛ جیا بوونەوە 🇮🇷 گُسستن؛ جُدا شدن

**ڤەقەتاندن** / veqetandin/: چاوگ. لێک جیا کردنەوە (شتی پێکەوە لکاو) 🇮🇷 گسستن؛ جُدا کردن (اجزاء به هم پیوسته)

**ڤەقەتیان** / veqetyan/: ☜ **ڤەقەتان**

**ڤەقەتین** / veqetîn/: ☜ **ڤەقەتان**

**ڤەقەلاشتن** / veqelaştin/: ☜ **قەڵشاندن**

**ڤەقەڵشاندن** / veqelşandin/: چاوگ. *[مەجاز]* چاو کردنەوە؛ زەق ڕوانین؛ بە وردی نواڕین 🇮🇷 با دقت نگاه کردن

**ڤەقەومین** / veqewmîn/: چاوگ. قەومان؛ قۆمین؛ ڕوو دان (شتی خراو) 🇮🇷 رُخ دادن

**ڤەقیژاندن** / veqîjandin/: چاوگ. زیڕاندن؛ زیقاندن 🇮🇷 جیغ کشیدن

**ڤەکایی** / vekayî/: ناو. کاوێژکەر 🇮🇷 نشخوار کننده

**ڤەکایین** / vekayîn/: چاوگ. کاوێژ کردن؛ قاویش کردن 🇮🇷 نشخوار کردن

**ـ ڤەکر** / vekir-/: پاشەوشە. ـ ڤەکەر؛ ـکەرەوە 🇮🇷 ـگُشا

**ڤەکرژین** / vekirjîn/: چاوگ. مزمزین؛ بزە کردن 🇮🇷 لبخند زدن

**ڤەکرن** / vekirin/: چاوگ. ١. باز کردن؛ ڤالا کرن؛ ئاواڵە کردن ‹هەریەک ژێرە تشتەک بر/ پیرێ ڤالا خوە ڤەکر «جگەرجوین»› ٢. شی کردنەوە؛ شیەو کردن 🇮🇷 ١. گشودن ٢. حلاجی کردن

**ڤەکرۆخ** / vek(i)rox/: ☜ **ڤەکەر**

**ڤەکری** / vekirî/: ناوەڵناو. ١. ئاواڵە؛ لێک کراوە؛ ڤالا بووی ٢. شی کراوە 🇮🇷 ١. گشوده؛ ازهم باز شده ٢. حلاجی شده

**ڤەکرووپان** / vekřupan/: چاوگ. ڤەکرووپاندن؛ چاڤگری کرن؛ چاو پۆشین 🇮🇷 چشم‌پوشی کردن

**ڤەکرووپاندن** / vekřupandin/: ☜ **ڤەکرووپان**

**ڤەکشاندن** / vek(i)şandin/: چاوگ. ١. ڕاخستن؛ داخستن ٢. ڕاکێشان بە زەمیندا ٣. درێژ کردنەوە ٤. کێشانی توتن و جگەرە 🇮🇷 ١. گُستردن ٢. بر زمین کشیدن ٣. کش دادن ٤. دخانیات استعمال کردن

**ڤەکشکشاندن** / vekişk(i)şandin/: چاوگ.

ڕاکێشان بە سەر عەرزا 🇮🇷 بر زمین کشیدن

**ڤەکشین** / vek(i)şîn/: چاوگ. ١. کشانەوە؛ وەکشان؛ بەرەوپاش بزووتن ٢. پەژیوان بوونەوە؛ پاشەکشە کردن 🇮🇷 ١. عقب کشیدن ٢. پشیمان شدن

**ڤەکوداد** / vekudad/: ناوەڵناو. ورد و خان؛ داغان 🇮🇷 درب و داغان

**ڤەکوروژتن** / vekurojtin/: چاوگ. ڤەکوروژین؛ ڤەکۆرژین؛ کرۆشتن؛ بە ددان ورد کردن 🇮🇷 خاییدن؛ با دندان خُرد کردن

**ڤەکوروژین** / vekurojîn/: ☜ ڤەکوروژتن

**ڤەکوشتن** / vekuştin/: چاوگ. ١. کوژاندنەوە؛ گڕ نەهێشتنی ئاگر ‹بوتخانە ب ئاگرێ دشوشتن/ ئاتەشکەدە جوملەکی ڤەکوشتن «خانی»› ٢. سڕینەوە؛ کوژاندنەوەی نووسراو ‹چرا بە فی ڤەکوشت› ٣. سەرژێ کرن؛ سەر بڕین 🇮🇷 ١. خاموش کردن آتش ٢. پاک کردن نوشته ٣. سر بُریدن

**ڤەکۆچاندن** / vekoçandin/: چاوگ. گۆزاندنەوە؛ ڕەو پێ کردن؛ ماڵومال پێ کردن 🇮🇷 کوچ دادن

**ڤەکۆرژین** / vekorjîn/: ☜ ڤەکوروژتن

**ڤەکۆک** / vekok/: ناو. جەڕبادەر؛ پێچ‌کوشتی 🇮🇷 پیچ‌گوشتی

**ڤەکۆلان** / vekolan/: چاوگ. ڤەکۆلین: ١. هەڵکەندن؛ هەڵکۆلین ٢. تۆژینەوە؛ لێکۆڵینەوە 🇮🇷 ١. حفر کردن ٢. پژوهیدن

**ڤەکۆلین** / vekolîn/: ☜ ڤەکۆلان

**ڤەکوتاندن** / vekûtandin/: چاوگ. داکوتاندن (بزمار و...) 🇮🇷 کوبیدن (میخ و ...)

**ڤەکە** / veke/: ئامراز. چەشنی؛ جۆری؛ وەک؛ وەکی 🇮🇷 مانندِ

**ڤەکەتن** / veketin/: چاوگ. ڕازان؛ ڕاکشان 🇮🇷 دراز کشیدن

**ڤەکەر** / veker/: ناوەڵناو. ڤەکرۆخ: ١. داخراو کەرەوە ‹ڤەکەرێ سمیناری› ٢. تایبەتمەندی ئامرازێ کە داخراو دەکاتەوە 🇮🇷 ١. گُشاینده ٢. بازکُن

**ڤەکی** / vekî/: ئامراز. چەشنی؛ وەک؛ وەکوو 🇮🇷 مانندِ؛ مثلِ

**ڤەکیان** / vek(i)yan/: چاوگ. شلەقان؛ ژەنران 🇮🇷 به هم زده شدن مایع

**ڤەکیشاندن** / vekîşandin/: چاوگ. ١. سەرمەشق دادان ٢. نژوە پێ کردن 🇮🇷 ١. سرمشق نوشتن ٢. دیکته کردن

**ڤەکێش**[1] / vekêş/: ناو. ١. کاری دەرکێشان ٢. کاری خۆ لە بەر یەک کێشانەوە ٣. کێش بە تەرازوو 🇮🇷 ١. عمل آختن؛ برکشیدن ٢. عمل کشیدن عضلات برای رفع خستگی ٣. توزین

**ڤەکێش**[2]: ناوەڵناو. ١. قایم لە ڕاکێشاندا ٢. *[کنایی]* چەنەبازی زۆروەڕ 🇮🇷 ١. کشدار ٢. ژاژخا

**ڤەکێشان** / vekêşan/: چاوگ. ڤەکێشین؛ ڤەکشین؛ کشانەوە؛ بۆ دواوە هاتنەوە ‹ڤەکێشانا هێزێت شەرکەر؛ هێزین شەرکەر هاتن ڤەکێشان› 🇮🇷 عقب‌نشینی کردن

**ڤەکێشک** / vekêşik/: ناو. تەز؛ تەزوو؛ مچوڕک 🇮🇷 حالت تیر کشیدن اندام

**ڤەکێشی** / vekêşî/: ناو. کێش؛ پێز 🇮🇷 کشداری

**ڤەکێشین** / vekêşîn/: ☜ ڤەکێشان

**ڤەگالیان** / vegalyan/: چاوگ. ڕاچڵەکین؛ داچڵەکین؛ داچڵەکان 🇮🇷 یکّه خوردن

**ڤەگر** / vegir/: ناوەڵناو. پاشەکەوت‌کەر؛ دەست‌پێوەگر؛ تایبەتمەندیی کەسێ کە دەست بە خەرجەوە دەگرێ 🇮🇷 صرفه‌جو

**ڤەگرتن** / vegirtin/: چاوگ. ١. پاشەکەوت کردن ٢. هەڵدانی چادر ٣. گرتنی نەخۆشی لە نەخۆشێکی تر ٤. ڕائەنگاوتنی چیغ و... ٥. دیسان گرتنەوە ٦. داگیر کردن 🇮🇷 ١. صرفه‌جویی کردن ٢. برپا کردن خیمه ٣. گرفتن بیماری از دیگری

۴. با چیغ و امثـال آن پیرامـونی را گـرفتن ۵. دوبـاره گرفتن ۶. اشغال کردن

**ڤەگرتی** / vegirtî/: ئاوەڵناو. داگیرکراو؛ ئەستێندراو ☰ غصب شده

**ڤەگری** / veg(i)rî/: ناو. کار و ڕەوتی ڤـەگـرتن ☰ صرفەجویی

**ڤەگژان** / vegjan/: چاوگ. هـەژان؛ جوولـین ☰ جُنبیدن

**ڤەگژانـدن** / vegjandin/: چـاوگ. جوولانـدن؛ هەژاندن ☰ جُنباندن

**ڤەگژگژانـدن** / vegijg(i)jandin/: چاوگ. تـەکانی لەسەریەک پێ دان ☰ تکان ـ تکان دادن

**ڤـەگژگژین** / vegijg(i)jîn/: چـاوگ. تـەکانی لەسەریەک خواردن ☰ تکان ـ تکان خوردن

**ڤـەگژلان** / vegijlan/: چـاوگ. ڤـەگژلین؛ خـۆ هەژاندن؛ خۆ ڕاوەشاندن ☰ خود را تکان دادن

**ڤەگژلین** / vegijlîn/: ☜ **ڤەگژلان**

**ڤەگڤاشـتن** / veg(i)vaştin/: چـاوگ. ڤەگڤشـتن؛ توند گوشین؛ بە نهێم کوشین؛ لە زەبر وشین ☰ مُحکم فشردن

**ڤەگڤزانـدن** / vegivzandin/: چـاوگ. گەڤـزاندن؛ گەوزاندن؛ تل پێ دان ☰ غلتاندن

**ڤەگڤشتن** / veg(i)viştin/: ☜ **ڤەگڤاشتن**

**ڤەگورزین** / vegurzîn/: چاوگ. بە گورجی و بەلەز هەلاتن؛ چالاکانە ڕاکردن ☰ شتابان گُریختن

**ڤەگوهارتن** / veguhartin/: چاوگ. گۆڕینەوە؛ شت بە شت دان ☰ معاوضه کردن

**ڤەگوهازتن** / veguhaztin/: ☜ **ڤەگوهاستن**

**ڤەگوهاستن** / veguhastin/: چـاوگ. ڤـەگوهازتن؛ ڤـەگوهەراندن؛ ڤـەگوهەرین: ١. ڕاگـوێزان؛ لـە شوێنێک بۆ شوێنیتر چوون ٢. گۆڕینەوە ‹ئەز ئوو وێ مـەترمپێلێ خـوە ب هـەڤ گوهاسـتین› ☰ ١. انتقال یافتن ٢. عوض کردن

**ڤەگوهشتین** / veguhiştîn/: چـاوگ. خـۆ لـە کـار دزینەوە ☰ از زیر کار دررفتن

**ڤەگوهەراندن** / veguherandin/: ☜ **ڤەگوهاستن**

**ڤەگوهەرین** / veguherîn/: ☜ **ڤەگوهاستن**

**ڤـەگۆتن** / vegotin/: چـاوگ. ١. گێڕانـەوە؛ بـاس کردن؛ دیسان گوتنەوە ٢. کاڤشـکی/ بـەربووری/ دوابینی کردن؛ قسە لە داهاتوو کردن ☰ ١. روایت کردن ٢. پیش‌بینی کردن

**ڤەگەڕ**[1] / vegeř/: ناو. کـاری زڤـڕین؛ وەگـەڕان ☰ بازگشت

**ڤەگەڕ**[2]: ئاوەڵناو. پەیجۆ؛ شوێنگر ☰ جوینده

**ڤەگەڕانـدن** / vegeřandin/: چاوگ. ڤـەگێڕان: ١. زڤڕاندن؛ دانـەوە ٢. دانـەوەی وام ٣. گێڕانـەوەی ڕووداو ☰ ١. بازگرداندن ٢. پـس دادن وام ٣. بـازگو کردن

**ڤەگـەڕیـان** / vegeřyan/: چـاوگ. ڤـەگەڕین؛ زڤـڕینەوە؛ گەڕانـەوە؛ گەڕیانـەوە؛ هەڵـەوگەڕیان ‹ئەڤ ژی ڤەگەڕین ب ڤێ لیباسی/ حازر شەلیان کـو کەس نەناسی «خانی»› ☰ بازگشتن

**ڤەگەڕین** / vegeřîn/: ☜ **ڤەگەڕیان**

**ڤەگەز** / vegez/: نـاو. چزووی دووپشـک و مـار ☰ نیش عقرب و مار

**ڤەگەزاندن** / vegezandin/: چاوگ. پێوەدانی مـار و دووپشک ☰ گزیدن مار و عقرب

**ڤەگەشین** / vegeşîn/: چاوگ. ١. هەڵـبوونی ئـاگر ٢. بە پۆلوو بوونی ڕەژی ٣. شەق و تـورت بـوون (گوڵ و گیا) ٤. بووژانەوە؛ دیسان بەخۆدا هاتنـەوە ☰ ١. مُشتعل شـدن آتـش ٢. اخگـر شـدن زُغـال ٣. شاداب شدن (گـل و گیـاه) ۴. سـرحال آمـدن (بعـد از پژمردگی)

**ڤەگەڤزاندن** / vegevzandin/: چاوگ. مـل دەبـەر مل نان؛ یەکتر لە زەوی دان ☰ گلاویز شدن

**ڤەگەڤزین** / vegevzîn/: چـاوگ. تل دان لـە سـەر

زەوی ⧖ غلتیدن بر زمین
**ڤەگەمزین / vegemzîn/**: چاوگ. پەڕین؛ باز دان؛ باز بردنی بە تەوژم ⧖ جهیدن؛ پریدن
**ڤەگێران / vegêřan/**: ☜ **ڤەگەڕاندن**
**ڤەل / vel/**: ئاوەڵناو. بڵ؛ ڤل؛ ڕەقی نەرمبوو ⧖ نرم شده
**ڤەلا[1] / vela/**: ناو. تازیانە؛ شەلاخ؛ قامچی ⧖ تازیانە
**ڤەلا[2]**: ئاوەڵناو. بلاو ‹ڤەلا کەردەنێ› ⧖ پراکندە
**ڤەلاشتن / velaştin/**: چاوگ. قەڵشاندنەوە؛ تلیشاندنەوە ⧖ بازشکافتن
**ڤەلگ / velg/**: ناو. بەڵگ؛ گەلا ⧖ برگ
**ڤەلۆ / velo/**: ناو. کار و ڕەوتی پشکنین؛ تۆژین ⧖ تفتیش؛ جستجو
▣ **ڤەلۆ کرن** پشکنین؛ لێگەڕان ⧖ جستجو کردن؛ تفتیش کردن
**ڤەلەزیان / velezyan/**: چاوگ. ڤەلەزین؛ ڕاکشان؛ هەلاژیان ‹ئاکۆ ژ بن دارێ ڤەلەزیایە› ⧖ دراز کشیدن
**ڤەلەزین / velezîn/**: ☜ **ڤەلەزیان**
**ڤەلەقاندن / veleqandin/**: چاوگ. ڤەلەیستاندن؛ ڤەلیستاندن؛ لەقاندنەوە؛ ڕاژاندن ⧖ بە نوسان درآوردن
**ڤەلەیستاندن / veleystandin/**: ☜ **ڤەلەقاندن**
**ڤەلیستاندن / velîstandin/**: ☜ **ڤەلەقاندن**
**ڤەلیستن / velîstin/**: چاوگ. لێستنەوە؛ بە زمان خاوێن کردنەوە ⧖ لیسیدن
**ڤەمالین / vemalîn/**: چاوگ. دەست بە لەشدا هێنان بە تەوژم؛ شێلانی پشت و ئەندام ⧖ ماساژ دادن
**ڤەمان / veman/**: چاوگ. جێمان؛ بەجێمان ⧖ جاماندن
**ڤەمای / vemay/**: ئاوەڵناو. جێماو؛ بەجێماو ⧖ جاماندە

**ڤەمران / vem(i)ran/**: چاوگ. ڤەمرین؛ کوژانەوە؛ تەمرانی ئاگر ⧖ خاموش شدن آتش
**ڤەمراندن / vem(i)randin/**: چاوگ. کوژاندنەوە؛ تەمراندنی ئاگر ⧖ خاموش کردن آتش
**ڤەمرتن / vemirtin/**: چاوگ. ١. ڤەمران؛ کوژانەوە ‹ئاگر ڤەمرت هەوا هەوایە/ ئاف هەر چکیا هەبا هەبایە «ئەحمەدی خانی»› ٢. زەرد هەڵگەڕان ٣. لەڕ و لاواز بوون ⧖ ١. خاموش شدن ٢. زرد شدن ٣. لاغر شدن
**ڤەمرتی / vemirtî/**: ئاوەڵناو. خامۆش‌بوو؛ کوژاوە ⧖ خاموش‌شدە
**ڤەمرین / vem(i)rîn/**: ☜ **ڤەمران**
**ڤەمزتن / vemiztin/**: ☜ **ڤەمستن**
**ڤەمژۆک / vemjok/**: ئاوەڵناو. مژۆک؛ بە تایبەتمەندی هەڵمژینەوە ⧖ مکندە
**ڤەمژین / vem(i)jîn/**: چاوگ. ڤەمێتن؛ مژین؛ مژ لێدان ⧖ مکیدن
**ڤەمستن / vemistin/**: چاوگ. ڤەمزتن؛ هەڵقوڵین؛ ئاو لە کانی دەرپەڕین ⧖ جوشیدن آب از چشمە
**ڤەمشتن / vemiştin/**: چاوگ. ١. ڤەمژین؛ هەڵمژین ‹مە نزانی کو مەلەک یا نە بەشەر یا پەری بوو/ یەدێ بەیزا وەکوو مووسایێ ل ڤەتلێ ڤە د مشت «خانی»› ٢. باسک و دەلنگ هەڵماڵین ٣. مشت‌وماڵ کردن ٤. *[مەجاز]* نۆژەن کردنەوە؛ چا کردنەوە ⧖ ١. مکیدن ٢. ورمالیدن ٣. صیقل دادن ۴. تعمیر کردن
**ڤەمەرقین / vemerqîn/**: چاوگ. ١. شەکەت بوون ٢. پڕ بوون و سەرڕێژ کردن ⧖ ١. خستە شدن ٢. سرریز کردن
**ڤەمێتن / vemêtin/**: ☜ **ڤەمژین**
**ڤەنا / vena/**: ناو. دار؛ درەخت؛ درووشە ⧖ درخت
**ڤەناسین / venasîn/**: چاوگ. ١. ناسینەوە؛ وەبیر هاتنەوە ٢. پێ‌هاتن؛ دان پێدا نان؛ مکوور بوون

☰ ١. بازشناختن ٢. اقرار کردن

**ڤەنان** / venan/: چاوگ. ١. هەڵنیشتنی باڵندە لـە سەر لکی داران ٢. دانان؛ دانـین ‹کـەمین ل بـەر دژمنان ڤەنان› ☰ ١. نشستن پرنده بر درخت ٢. نهادن

**ڤەناندن** / venandin/: چاوگ. ١. هیم دانان؛ بناغـە داڕژتن ٢. وەدیهێنان؛ بەدیهێنان ٣. کـرژ/ گـەش کردنەوە ٤. هەڵگرتن؛ بڵند کردن ☰ ١. پایـەریـزی کردن ٢. ایجاد کردن ٣. کوک/ شارژ کردن ۴. برداشتن

**ڤەنژین** / venjîn/: چاوگ. گەشە کردن؛ بە خـۆدا هاتن ☰ شاداب شدن

**ڤەنشتن** / venişti̇n/: چاوگ. ڤەنیشتن؛ ڤژڤـاندن: ١. نیشـــتنەوە ٢. چوونـــە خـــواری تلـــتە ٣. نیشـتنەوەی وەرهـەم و ... ☰ ١. فـرود آمـدن ٢. تەنشین شدن ٣. خوابیدن ورم و ...

**ڤەنشتی** / venişti̇/: ناوەڵناو. ١. نیشتوو؛ لـە فـڕین بوو ٢. نیشتووی تلتە ٣. پووچاوە ☰ ١. فرودآمـدە ٢. تەنشین شدە ٣. فروکش.کردە

**ڤەنوسکاندن** / venuskandin/: چـاوگ. لکانــدن؛ چەسپاندن؛ نووساندن ☰ چسباندن

**ڤەنووسین** / venûsîn/: چاوگ. ١. پێوە نووسـان ٢. تێ‌هەڵسووان؛ پیا ساویان ☰ ١. چسبیدن ٢. اندودە شدن

**ڤەنهراندن** / venihrandin/: چاوگ. ١. هەڵـگرتن؛ بەرزەو کردن ٢. هەڵستاندن؛ هێنانە سەرپا ☰ ١. برداشتن ٢. برخیزاندن

**ڤەنهرین** / venihrîn/: چاوگ. ١. ڕاپەڕین لـە پـڕا؛ لە ناکاو ڕاستەوە بوون ٢. هەڵستان؛ هەڵسـان ☰ ١. از جا پریدن ٢. برخاستن

**ڤەنهشتی** / venihiştî/: ناوەڵـــناو. ئۆقرەگرتـــوو؛ ئارامبوو ☰ آرام گرفتە

**ڤەنهشتین** / venihiştîn/: نـاو. ئـۆقرە گـرتن؛ ئـارام گرتن ☰ آرام گرفتن

**ڤەنهێران** / venihêřan/: چـاوگ. ڤـــەنهێراندن؛ دیسان تواشا کردن ☰ بازنگریستن

**ڤەنهێراندن** / ven(i)hêřandin/: ☜ **ڤەنهێران**

**ڤـەنی** / venî/: نـاو. ١. دارقـــەزوان؛ دارەبـــەن ٢. قەزوان؛ کەسکان؛ بەری دارەبەن ☰ ١. درخت بُنـە ٢. چاتلانقوش؛ پستە کوهی

**ڤەنیشتن** / venîştin/: ☜ **ڤەنشتن**

**ڤـەنین** / venîn/: چـاوگ. ١. لـــە بـــەین بـــردن؛ نەهێشتن ٢. لێدان؛ کوتان ٣. گەسـتن (بـۆ مـار) ‹جۆتەک گولیان بوون، جۆتەک مار ئوول من ڤەنین› ☰ ١. از بین بردن ٢. کتک زدن ٣. گزیدن

**ڤەور** / vewr/: ناو. ڤەرڤە؛ بەفر ☰ برف

**ڤەوراندن** / vewrandin/: چاوگ. ئاشـکرا کـردن؛ پەردە لە سەر هەڵگرتن ☰ آشکار کردن

**ڤەوەراندن** / vewerandin/: چاوگ. فاماندن؛ ڕوون کردنەوەی مەبەستێک ☰ تفهیم کردن

**ڤـەوەژارتن** / vewejartin/: چـاوگ. ١. بـــژاردنی دانەوێڵە ٢. بەرد بژاردن؛ خاوێن کردنەوەی زەوی کێڵگە لە بەرد ☰ ١. پـاک کـردن غـلات ٢. جمـع کردن سنگ از زمین زراعتی

**ڤەوەشاندن** / veweşandin/: چاوگ. ١. فـڕێدان؛ تـووڕ هەڵـدان ٢. هەژانـدن ‹تـیرەک ژ کـەمانێ غەزەبێ دا جەگەرێ ریش/ مل دانە بەر و سـەر ژ دوو گووشان ڤەوەشاندن «مەلای جزیری»› * هەروەها: **ڤەوەشان** ☰ ١. پرت کردن ٢. تکان دادن

**ڤەوینی** / vewînî/: ناو. ئاکار؛ خۆ؛ خدە ☰ اخلاق

**ڤەوێرتن** / vewêrtin/: چاوگ. فـەرق و جیـاوازی خستن؛ بە دووچاوەکی ڕوانـین ☰ تبعـیض قائـل شدن

**ڤەهاتن** / vehatin/: چاوگ. ١. هەڵاتنی هەویر ٢. سەر دەرێنانی ڕوەک لە زەوی ٣. سەر هەڵـێنان و چا بوونەوە لە نەخۆشی ٤. پاشـگەز بوونـەوە ☰ ١. ورآمـدن خمیـر ٢. بردمیـدن نباتـات ٣. بازیـافتن سلامت ۴. پشیمان شدن

**ڤەهار** / vehar/: ناو. بەهار ☰ بهار

**ڤەهارین** / vehařîn/: چاوگ. ڤەهێڕان؛ هاڕان؛ کردنە ئارد ☰ ساییدن؛ آرد کردن

**ڤەهاندن** / vehandin/: چاوگ. ١. ڕستن؛ ڕێسان؛ مووناندن؛ هۆنینەوە ‹دایکا من پرچا من دڤەهینە› ٢. دەربڕین ‹ئەز دێ هۆزانەکێ ب ئاڤێ تە ڤەهینم› ☰ ١. ریسیدن ٢. بیان کردن

**ڤەهسیان** / vehisyan/: چاوگ. ڤەهەسین؛ حەسانەوە؛ سانەوە ☰ آسودن

**ڤەهشتن** / vehiştin/: چاوگ. هێشتنەوە ‹شیر و خشتن، زلف و قشتن، من وەشارن، من وەهشتن/ پەهلەوانان دەست ڤە مشتن، دل ژ من بر، دل ژ من «مەلای جزیری»› ☰ باقی گذاشتن

**ڤەهلدان** / vehildan/: چاوگ. چاو داگرتن؛ بە چاو هێما کردن ☰ چشمک زدن

**ڤەهۆلان** / veholan/: ناو. ئۆلان؛ ڕەوتی دەنگ دانەوە ‹گەلۆ ڤێ گۆتنێ چما نەوقاس ڤەهۆلان دا؟› ☰ پژواک

**ڤەهوونان** / vehûnan/: چاوگ. ڤەهووینان؛ ڤەهینان؛ هۆندن؛ هۆندنەوە ☰ بافتن

**ڤەهووینان** / vehûynan/: ☜ ڤەهوونان

**ڤەهەڕاندن** / veheřandin/: چاوگ. ١. هەرا و هوریا کردن ٢. عا لە مێگەل کردن (بۆ ئاو خواردنەوە و ...) ☰ ١. دادوقال کردن ٢. هی کردن گله (برای آب خوردن و ...)

**ڤەهەژاندن** / vehejandin/: چاوگ. ڕاتلەکاندن؛ هەژاندن. هەروەها: **ڤەهەژین** ☰ تکان دادن؛ جُنباندن

**ڤەهەسین** / vehesîn/: ☜ ڤەهسیان

**ڤەهەواندن** / vehewandin/: چاوگ. کۆ کردنەوە؛ گرد کردنەوە ☰ جمع کردن

**ڤەهینان** / vehînan/: ☜ ڤەهوونان

**ڤەهێڕان** / vehêřan/: ☜ ڤەهارین

**ڤەهێڕیای** / vehêřyay/: ئاوەڵناو. هاڕاو؛ هاڕدراو ☰ ساییده؛ آسیاب شده

**ڤەهێشت** / vehêşt/: ناو. بەهەشت ☰ بهشت

**ڤەهێلان** / vehêlan/: چاوگ. جێهێشتن؛ تەرک کردن ☰ ترک کردن

**ڤەهێلای** / vehêlay/: ئاوەڵناو. بەجێ هێڵراو؛ تەرک‌کراو ☰ ترک شده

**ڤەیتوون** / veytûn/: ناو. ئاگردانی گەرماو؛ توونی حەمام ☰ آتشدان حمام

**ڤهر** / vihr/: ئاوەڵناو. زرنگ لە کار و کاسبیدا ☰ زیرک در کسب و کار

**ڤی** / vî/: ئاوەڵناو. ئەو (نێر) ☰ آن (مذکر)

**ڤیاد** / v(i)yad/: ئاوەڵناو. ١. شەختە لێ داو (زرعات) ٢. نەرمان و بێ بەرد (زەوین) ☰ ١. سرمازده (کشتزار) ٢. نرم و بدون سنگ (زمین)

**ڤیار** / v(i)yar/: ئاوەڵناو. لە بەر سەرما و سۆڵە هەڵتەکاو (زەوی) ☰ سُست شده از یخبندان (زمین)

**ڤیارتەی** / v(i)yartey/: چاوگ. بواردن؛ تێپەڕین ☰ گذشتن

**ڤیارەی** / v(i)yarey/: چاوگ. بواردن ☰ گذشتن

**ڤیام** / v(i)yam/: ناو. گەشە؛ خیف؛ هەرەش ☰ رُشد

**ڤیان**[1] / v(i)yan/: چاوگ. خواستن؛ ویستن ☰ خواستن

**ڤیان**[2]: ناو. ڤیناس؛ عیشق؛ خۆشەویستی ☰ عشق؛ محبت

**ڤیت** / vît/: ئاوەڵناو. قوت؛ قیت ‹گوهێ مشک ڤیتن› ☰ برجسته

**ڤیتامین** / vîtamîn/: ☜ ویتامین

**ڤیتۆ** / vîto/: ناو. ویتۆ: ١. بەرگری زۆردارانە ‹ڕووس ڤیتۆی کرد› ٢. دەسەڵاتی کەس یان دامەزراوەیەک لە هەڵوەشاندنەوەی کار یان بڕیارێکدا ‹مافی ڤیتۆ› ☰ ١و٢. وتو

⊡ **ڤیتۆ کردن**: ویتـۆ کـردن؛ هەڵـگەڕاندنەوە و پووچەڵ کردنەوەی بـڕیاری شـاند و کـۆڕێکی قانوونی ‹ئەمریکا بـڕیاری دژ بـە ئیسـرائیلی ڤـیتۆ کرد› ▤ وتو کردن

**ڤیچ / vîç/**: ئاوەڵناو. فیچ؛ خوار ▤ کج

**ڤیچک / vîçik/**: ناو. چلم؛ چـرم؛ تـراوی خەسـتی کەپۆ ▤ خُلم

**ڤیچەکی / vîçekî/**: نـاو. نەخۆشـــییەکی ئاژاڵـــە مرخەمرخ لە گەرووی دێت ▤ نوعی بیماری دام

**ڤیدەرێ / vîderê/**: ☜ **ڤێدەری**

**ڤیدیۆ / vîd(i)yo/**: نـاو. ویـدیۆ؛ ویـدئۆ؛ دەزگـای تۆمارکردن و بلاوکردنەوەی میغناتیسی دەنـگ و ڕەنگ ▤ ویدئو

**ڤیر / vîr/**: ئاوەڵکار. ڤێدەرێ؛ ئەوێ ▤ آنجا

**ڤیڕان / vîřan/**: چـاوگ. فیڕان؛ ڤـیڕاندن ▤ ریـدن اسهالی

**ڤیڕاندن / vîřandin/**: ☜ **ڤیڕان**

**ڤیزا / vîza/**: ☜ **ویزا**

**ڤیزار / vîzar/**: ناو. داد و هاوار بۆ دە فریا هـاتن ▤ داد و فریاد و طلب کمک کردن

**ڤیزنای / vîznay/**: چاوگ. فیزەکردن ▤ زوزە کشیدن

**ڤیزنەی / vîzney/**: چاوگ. ویزەویـز کـردن ▤ وزوز کردن

**ڤیزین / vîzîn/**: ☜ **ڤزین**

**ڤیژک / vîjik/**: نـاو. ١. گووشلە ٢. دڵـۆپەی مـیچ؛ تکەی بان ▤ ١. مدفوع آبکی ٢. چکّەی بام

**ڤیس / vîs/**: ☜ **بیست**

**ڤیلک / vîlik/**: نـاو. ١. کیسەی دەمتەنگ ٢. گزی؛ گەڕ؛ فێڵ ▤ ١. کیسەی دهانه تنگ ٢. حیله؛ مکر

**ڤیلین / vîlîn/**: چاوگ. جنێو دان ▤ دُشنام دادن

**ڤین / vîn/**: ناو. ١. واز؛ ئـارەزوو؛ تاسـە ٢. ئـەوین؛ ئەڤین ‹من بدووڤێ دنێ گرت، ڤینا ڤـێ کـەت دلـێ من/ بارێ گوند و ئێ کولفەت، هەمێ کەت سەر ملـێ من «جگەر خوین»› ٣. فلتە؛ شیتە؛ قسەی بێمانا ▤ ١. آرزو ٢. عشق ٣. یاوه

**ڤینا / vîna/**: جێناو. ئەمە؛ ئەڤە ▤ این

**ڤیناس / vînas/**: ناو. ڤیان؛ ئـەوین؛ خۆشەویسـتی ▤ محبت؛ عشق

**ڤینای / vînay/**: چاوگ. ڤینتەی؛ بینین ▤ دیدن

**ڤینتەی / vîntey/**: ☜ **ڤینای**

**ڤینڤینۆک / vînvînok/**: ئاوەڵـناو. گنگنۆک؛ مـنگن ▤ ویژگی کسی که غنّه در بینی دارد

**ڤینک / vînik/**: نـاو. جگـی بزنـەکێوی ▤ قـاب بُـز کوهی

**ڤینیەی / vînyey/**: چاوگ. بینران ▤ دیده شدن

**ڤیۆلۆن / v(i)yolon/**: ناو. سینەکەمان؛ ئـامرازێکی مۆسیقایە ▤ ویلون

**ڤیەردەی / v(i)yerdey/**: چاوگ. بەخشین؛ بووردن ▤ بخشیدن

**ڤێ[1] / vê/**: نـاو. ناوی بیستەمین پیتی ئـەلفوبێـی زمانی کوردی ▤ نام حرف بیستم الفبای زبان کردی

**ڤێ[2]**: ئاوەڵناو. ئاوها؛ وەهـا؛ ئـاوا ‹کـو کاتیـب دێمـی جەدوەل کەت، شکەستە خـەت موسەلسـەل کـەت/ ژ یەک حەرفان موفەسسەل کەت، کیـیە ڤـێ موشـکلێ حەل کەت؟ «مەلای جزیری»› ▤ چنین

**ڤێ[3]**: جێناو. وێ؛ ئـەم؛ ئامـاژە بـۆ مێوینـە و نزیـک ‹یەکێ لە خزمەکانی ڤێ هەڵیدایە: گەر گجی ئەم لە لای پێشـەوە دراوە، ڤـێ ڕاسـت ئـەکا و ئـەم ڤـرۆیە «هەژار، *قورئان*»› ▤ این (مؤنث)

**ـ ڤێت / -vêt/**: پاشەوشە. ـ خواز ▤ ـ خواه

**ڤێتن / vêtin/**: چـاوگ. ویسـتن؛ ئارەزوو کردن؛ بـە ئاوات خواستن ▤ آرزو کردن

**ڤێتەی / vêtey/**: چاوگ. بێژتن؛ لە هێڵەگ دان ▤ بیختن

**ڤێجا / vêca/**: ئامراز. ڤێگا: ١. دە؛ دەسا ٢. ئەگـەر وایە؛ کەوا بوو ▤ ١. پس اینطور ٢. بنابراین

**ڤێچنەی / vêçney/**: چاوگ. بێژتن ■ بیختن

**ڤێچیەی / vêçyey/**: چاوگ. بێژران ■ بیخته شدن

**ڤێخستن / vêxistin/**: چاوگ. ١. پێوە دالەقاندن ٢. هەڵکردن؛ گیرساندن؛ پێخستن ‹کێ ئاگر ڤێخست؟، ئەز چرا ڤێخست› ■ ١. آویزان کردن ٢. روشن کردن

**ڤێدەری / vêderî/**: ئاوەڵکار. ڤیدەرێ؛ ڤێرێ؛ ئەوێ ■ آنجا

**ڤێدەرێ / vêderê/**: ئاوەڵکار. ئێرە؛ ئەیرە ■ اینجا

**ڤێرە / vêre/**: ئاوەڵکار. لێرە؛ لەم جێگە ■ اینجا

**ڤێرەخ / vêrex/**: جێناو. ئەو تەرەف ■ آن طرف

**ڤێرێ / vêrê/**: ☜ ڤێدەری

**ڤێڕ / vêř/**: ئاوەڵناو. ١. خواروخێچ؛ چەوتوچەوێڵ؛ گێڕ؛ هێڕ ٢. خێل؛ خوێل ■ ١. کج و کوله ٢. لوچ

**ڤێڕا / vêřa/**: ئامراز. دەگەڵ؛ تەک؛ لەتەک ■ همراه

**ڤێڕک / vêřik/**: ناو. ڕووەی کەوش و پێلاو ■ رویەی کفش

**ڤێڕکە / vêřke/**: ناو. ڤیڕکە؛ تەقەفیڕە ■ اسهال

**ڤێڕگ / vêřig/**: ناو. پەرگەما؛ بەنچنراوی دەوری کاڵە ■ نخچین کنارەی گیوە

**ڤێڕە / vêře/**: ئامراز. ڤێڕا؛ پێڕا ■ همراهِ

**ڤێس / vês/**: ناو. جوێن؛ جنێو؛ دژمان ■ دُشنام

**ڤێسەن / vêsen/**: ئاوەڵناو. ئاڵ؛ سوور و سپی ■ سُرخ و سفید

**ڤێسین / vêsîn/**: چاوگ. ١. جوێن دان ٢. وەستانەوە ٣. حەسانەوە؛ پشوودان ■ ١. دُشنام دادن ٢. متوقف شدن ٣. استراحت کردن

**ڤێڤراندن / vêv(i)randin/**: چاوگ. ١. ڕاکێشان؛ بە سەر زەویدا کێشان ٢. بێلەشپۆش بوون؛ بێلێفە و سەرەناز بوون ■ ١. کشیدن بر زمین ٢. آسمان‌جُل بودن

**ڤێڤرین / vêv(i)rîn/**: چاوگ. ئاشکرا بوون؛ زرانی ڕاز ■ برملا شدن

**ڤێقاسێ / vêqasê/**: ئاوەڵکار. ئەوەندە؛ ئەوننە ■ آنقدر

**ڤێقڕاندن / vêq(i)řandin/**: چاوگ. ئاشکرا کردن ■ افشا کردن

**ڤێک[1] / vêk/**: ئاوەڵناو. تەنکاو ■ کم‌عُمق (آب)

**ڤێک[2]**: ئاوەڵکار. پێکەوە ■ باهم

**ڤێکئێخستن / vêk'êxistin/**: چاوگ. ڤێکخستن؛ ڤێکدان؛ خڕ کردنەوەی بلاو لە دەوری یەک ■ گرد هم آوردن

**ڤێکخستن / vêkxistin/**: ☜ ڤێکئێخستن

**ڤێکدان / vêkdan/**: ☜ ڤێکئێخستن

**ڤێکرا / vêkra/**: ئاوەڵکار. وێکڕا؛ پێکەوە؛ ڤێکرە؛ ڤێک ‹حوسن و جەمالێ خواست ئەڤین/ ڤێکرا د یەک زاتێ جڤین «مەلای جزیری»› ■ با هم

**ڤێکرە / vêkre/**: ☜ ڤێکرا

**ڤێکەتن / vêketin/**: چاوگ. ١. ڤێکەفتن؛ پرسین و تۆژینەوە ٢. هەڵبوونی ئاگر ‹ئاگرەک مەزن ڤێکەت› ■ ١. پرس‌وجو کردن ٢. مُشتعل شدن

**ڤێکەفتن / vêkeftin/**: ☜ ڤێکەتن ـ١

**ڤێگا[1] / vêga/**: ئاوەڵکار. ١. دەسبەجێ؛ دەم‌ودەس ٢. ئێستاکە؛ ئیسە؛ هەر ئیسە ■ ١. بی‌درنگ ٢. همین حالا

**ڤێگا[2]**: ☜ ڤێجا

**ڤێگاڤێ / vêgavê/**: ئاوەڵکار. ڤێگاوێ: ١. ڤێگا؛ ئێستا ٢. ئەوجار؛ ئەوکات ■ ١. حالا ٢. آن وقت

**ڤێگاوێ / vêgawê/**: ☜ ڤێگاڤێ

**ڤێل / vêl/**: ئاوەڵناو. ١. نزم؛ نەوی ٢. تەنکاو ■ ١. پست ٢. کم‌عُمق (آب)

**ڤێلا / vêla/**: ناو. دەشتی بەرین و لێژ ■ دشت وسیع و شیبدار

**ڤێلک / vêlik/**: ئاوەڵناو. دەم‌تەنگ ■ دهانه تنگ

**ڤێن / vên/**: جێناو. ئەمان؛ ئەمانە ■ اینها

**ڤێنە / vêne/**: ناو. ئاوات؛ ئارەزوو ■ آرزو

**ڤێنی / vênî/**: ئاوەڵناو. ئائەمە ■ این؛ همین

**ڤێوار / vêwar/**: ئاوەڵناو. تامەزرۆ ■ مُشتاق

# ق

**ق / q/**: پیت. بیست‌ویه‌کەمین نیشانەی پیتی ئەلفوبێی زمانی کوردی ⇆ ق؛ نشانەی بیست‌ویکمین حرف الفبای کُردی

**ق / qi/**: ناو. ناوی بیست‌ویەکەمین پیتی ئەلفوبێی زمانی کوردی ⇆ ق؛ بیست‌ویکمین حرف الفبای کُردی

**قا / qa/**: ناو. دەم؛ کات ‹ئەو قا بەفر ئەباری، بالاپیاوێ› ⇆ گاه؛ هنگام

**قاب / qab/**: ناو. ۱. جگ؛ قاپ؛ چوو ۲. قاپ؛ گوێزینگ؛ ڕەقێنە؛ قابگارە؛ زەنگۆڵ؛ جێگەی جگ لە پادا ۳. قاپ؛ دەفر و دەوری چێشت خواردن ٤. قافک؛ کالان؛ کالەنی ٥. هەند؛ حاند؛ ڕادە؛ ئەندازە ٦. بەرگی کتێب ⇆ ۱. شتالنگ؛ قاب ۲. قوزک پا ۳. ظرف غذاخوری ۴. نیام ۵. اندازه ۶. جلد کتاب

**قابز / qabiz/**: ☜ قابیز

**قابغ / qabiğ/**: ☜ قابڵۆخ

**قابگارە / qabgare/**: ☜ قاب ـ۲

**قابل / qabil/**: ئاوەڵناو. قابیل؛ قابلدار؛ قابیلدار؛ قابیلەت؛ بەرکەتی؛ شیاو ⇆ شایسته؛ قابل

⊡ **قابل نەبون**: بێ‌قابل بوون: ۱. کەم یا بێ‌بایەخ بوونی شتێ لە حاند کەسێکدا ‹پووڵ قابلی نییە با لاتەوە بێ!› ۲. نەبوونی عەقڵ و کارامەیی یان توانست و لێهاتوویی بە هۆی ڕژدی یان ترسەوە ‹دە ڕۆژ بێکار بوو، قابلی نەبوو یارمەتییەکمان بدات› ⇆ ۱. قابل نداشتن ۲. وجودش را نداشتن

**قابل نەزانین**: بایەخ پێ نەدان؛ قەدر نەزانین ‹قابلمان نازانی هەواڵێکمان بپرسی؟› ⇆ قابل ندانستن؛ ارزش قایل نبودن

**قابلدار / qabildar/**: ☜ قابل

**قابلۆخ / qablox/**: ناو. ۱. سەرپۆشی دەفر ۲. قاپلۆخ؛ تێکولی هەر شتێ ⇆ ۱. درپوش ظرف ۲. پوسته

**قابلەمە / qableme/**: ناو. ۱. قابلەمە؛ قاولەمە؛ قاملەمە؛ قاملەوە؛ قاوەلەمە؛ چان‌چیلک؛ چانچگ؛ قوشقانە؛ دەفرێکی سەرداری خەڵەڵە بۆ چێشت لێنان ۲. مەکووک؛ ماکۆ؛ ئامرازێکی مەکینەی دروومانە، غەرغەرەی لە سەر دادەنرێ ⇆ ۱. قابلمه ۲. ماکو

**قابڵۆخ / qabłox/**: ناو. قابغ؛ قاپۆڕ؛ جێ بارووتی فیشەک ⇆ پوکه

**قابڵەمە / qabłeme/**: ☜ قابلەمە ـ۱

⊡ **قابڵەمە کردن**: ۱. دیواری خشتی کاڵ بە کەرپووچ ڕووکێش کردن ۲. *[کینایه]* پینە بە سەردا گرتن ⇆ ۱. دیوار خشتی را با آجر پوشاندن

٢. پینه بر رویه زدن

**قابۆره / qabore/:** ☜ **قاپۆڕه**

**قابور / qabûr/:** ناو. ئەشکەولەت؛ سواڵەتەشکاو ☰ سُفال شکسته

**قابول / qabûl/:** ناو. پلووسک؛ پلوور ☰ ناودان

**قابیز / qabîz/:** ناو. ئیزرایل؛ قابز؛ قابێز؛ قافیز؛ فریشتەی گیان کێشان ‹بە جاهی خۆت مەنازە، ڕۆستەمی، قابیز لە ڕێتایە/ ئەگەر سەد شاهی چینیش بی، کشێکت هاتە بەر، ماتی «بێخود»› ☰ عزرائیل

**قابیل / qabîl/:** ☜ **قابل**

⊡ **قابیل بوون:** شیاو بوون؛ جێی بڕوا کردن یان وەرگرتن بوون ‹هیچ قابیلە تۆ شتی وا ئاسایی نەزانی؟!› ☰ قابل قبول بودن

**قابیل دیتن:** بە قابیل زانین ‹لە جەیبمدا ئەگەر یەک پارە شک نابەم، چ پەروامە؟/ خودا گەر قابیلی دیبم هەتا سەر جەیبی سەدپارەم «مەحوی»› ☰ لایق دانستن

**بە قابیل زانین:** ☜ **قابیل دیتن**

**قابیلدار / qabîldar/:** ☜ **قابل**

**قابیلە / qabîle/:** ناو. مامان؛ پیرک؛ ماهوو؛ ژنێ کە لە زاندا ئاریکاریی دایک دەکا ☰ ماما

**قابیلەت / qabîlet/:** ☜ **قابل**

**قابیلی / qabîlî/:** ئامراز. شیاوی؛ هێژای ‹قابیلی وتن؛ قابیلی بەزەیی› ☰ قابلِ؛ شایستەی

**قاپ**[1] **/ qap/:** ناو. ١. قاب؛ جگ؛ میچ؛ چوو ٢. دەفری بەردەستان ٣. بەلەک؛ پووز ٤. قاپوورە؛ گوێزینگ؛ قاب؛ جێگەی جگ لە پادا ٥. پارووی زل؛ تیکەی گەورە ٦. چوارچێوە ٧. قاب؛ کالان ٨. گرێی قامیش ٩. قسەی بنشڕ ١٠. قەپ؛ گاز بە ددان ١١. قاپی؛ بارەگا ‹گریان و شین دادت نادا/ هەی ڕوورەش لە قاپی خوادا! «هەژار، بۆ *کوردستان*»› ☰ ١. شتالنگ؛ قاب ٢. ظرف غذاخوری ٣. ساق پا ۴. قوزک پا ۵. لُقمەی بزرگ ۶ قاب؛ چهارچوب ٧. نیام ٨. بند نی ٩. حرف مُفت ١٠. گاز (دندانی) ١١. بارگاه

⊡ **قاپ قەوی کردن:** *[پلار]* شەرم شکان و ڕوو هەڵماڵیان ‹تازە وا قاپی قەوی کردووە، گوێ بە کەس نادا و شەرم لە کەس ناکا› ☰ پُررو شدن

**قاپ گرتن:** ١. پا گەزتن ٢. *[کنایە]* شەڕ فرۆشتن؛ کێشە تێهاڵاندنی بەخۆڕایی ٣. دە چوارچێوە گرتن؛ قاب کردنی وێنە ☰ ١. پا را گزیدن ٢. شر بە پا کردن ٣. قاب گرفتن

**خستنە قاپ:** دە قاپ گرتن ☰ قاب گرفتن

**قاپ**[2]**:** پێرۆ. ← **قرقاپ**

**قاپئاوێنە / qap'awêne/:** ناو. وەنەدی؛ سندۆقجام ☰ جعبەی شیشەای

**قاپاخ / qapax/:** ناو. قەپاخ؛ قەپاغ؛ قەباخ: ١. سەردەفک؛ سەرپۆشی دەفر ٢. قالپاخ ☰ ١. سرپوش ظرف ٢. قالپاق

**قاپار / qapar/:** ناو. گاز؛ گەز؛ قەپ؛ کاری هەر دوو ڕیزە ددان لێ توند کردن ☰ گاز (دندانی)

**قاپارگە / qaparge/:** ناو. پشت گوێزنگ؛ لای خوارووی بەلەک ☰ پایین ساق

**قاپان**[1] **/ qapan/:** چاوگ. ١. خۆ هەڵکێشان ٢. ☜ **قاپین** ☰ ١. خودستایی کردن ٢. ☜ **قاپین**

**قاپان**[2]**:** ناو. ١. قاپانە؛ قاپانێ؛ قاپێن؛ قاچێن؛ میچێن ٢. ☜ **قەپان-١** ☰ ١. قاببازی ٢. ☜ **قەپان-١**

**قاپان**[3]**:** ناوەڵناو. خۆبەزلزان؛ بەدەعیە ☰ مُتکبر

**قاپانچی / qapançî/:** ناو. قەپانچی؛ قەپاندار ‹قاپانچی نەوشی وە گونم دڵی تووقی! «مەسەل»› ☰ ترازودار

**قاپاندن / qapandin/:** ☜ **قاپین**

**قاپانە / qapane/:** ☜ **قاپان**[2]**-١**

**قاپانی / qapanî/:** ناو. فیز و بادیهەوایی ☰ تکبُر

**قاپانێ / qapanê/:** ☜ **قاپان**[2]**-١**

**قاپاویژ / qapawêj/**: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی مرۆ یان حەیوانێ کە لە ڕۆیشتنا قاپی پای ویک دەکەوێ ☰ ویژگی انسان یا حیوانی کە در راه رفتن قوزک پاهایش بە هم می‌خورند

▣ **قاپاویژ کردن**: ویک کەوتنی قاپی پێ لە ڕۆشتندا ☰ برخورد کردن قوزک‌های پا با هم، هنگام راه رفتن

**قاپچی[1] / qapçî/**: ناو. قاپیەوان؛ قاپیوان؛ قاپێوان؛ دەرکەوان ‹ژنەم جاروکیش خوەم قاپچی دەرم/ وە فەسل زمسان وەفرپاکەوکەرم! «شامی»› ☰ دربان

**قاپچی[2]**: ئاوەڵناو. ١. شتڕفێن ٢. کارامە لە قاپێندا ☰ ١. رُباینده ٢. ماهر در قاببازی

**قاپرەش / qapřeş/**: ئاوەڵناو. ١. کوێتی دامێن تاریک کە جومگەی دەستی ڕەش بێت (ئەسپ) ٢. *[کینایە]* پێ‌ڕەش؛ بەدودم؛ تاڵە؛ قۆشمە ☰ ١. کُمیت مچ دست سیاه (اسب) ٢. بدیُمن

**قاپشۆ / qapşo/**: ناو. قاپشۆر؛ قاپشۆە: ١. کەسێ کە قاپ دەشوا ٢. *[کینایە]* دەس‌وپا؛ نۆکەر و کارەکەر ☰ ١. ظرفشوی ٢. کلفت و نوکر

**قاپشۆر / qapşor/**: ناو. ١. ☜ **قاپشۆ** ٢. فەراخشۆ؛ دەسرەیەک کە دەفری پێ پاک دەکەنەوە ☰ ١. ☜ **قاپشۆ** ٢. پارچەی تمیز کردن ظروف

**قاپشۆە / qapşoh/**: ☜ **قاپشۆ**

**قاپشین / qapşîn/**: ناو. قاپشینکە؛ گیایەکی گەڵاپانی سپی‌واشە، لە دیم و زیاتر لە نێو بێستانە گرکە دەڕوێ، گوایە دەرمانی باڵووکە ☰ گیاهی است

**قاپشینکە / qapşînke/**: ☜ **قاپشین**

**قاپقاپ / qapap/**: ناو. پاپووچەی لە دار؛ شمکی دارین ☰ دمپایی چوبین

**قاپقاپۆکە / qapqapoke/**: ناو. خەربەنگ؛ گیایەکە دانەکەی بۆ ددان‌ئێشە بە کار دێنن ☰ گیاهی دارویی

**قاپک / qapik/**: ناو. پەنامی قاپی پێ ☰ ورم قوزک پا

**قاپکزێنە / qapk(i)zêne/**: ناو. قاپکەوڵە؛ گیایەکی گوڵ زەردی سپی‌واشەیە لە چێشت دەکرێ ☰ نوعی سبزی آشی

**قاپکەوڵە / qapkew(i)łe/**: ☜ **قاپکزێنە**

**قاپگر / qapgir/**: ئاوەڵناو. ١. تایبەتمەندی سەگێ کە پا دەگەزێ ٢. *[کینایە]* بەدفەڕ ☰ ١. پاچەگیر (سگ) ٢. موذی

**قاپلۆخ / qapłox/**: ناو. ١. تێکول؛ تۆکڵ ٢. ڕەقە پێستی وشکەوە بوو ‹قاپلۆخی کیسەڵ› ☰ ١و٢. پوسته

**قاپوقاپۆڕ / qap û qapoř/**: ناو. خرتکەوپرتکە؛ خرۆپرۆی ناو ماڵ ☰ خرت‌وپرت

**قاپوقاچاخ / qap û qaçax/**: ☜ **قاپوقاچاغ**

**قاپوقاچاغ / qap û qaçağ/**: ناو. قاپوقاچاخ؛ قاپوقنجاڕ؛ دەفر بەگشتی ‹هەر ئەو ئێوارە، مەنجەڵ و قاپوقاچاغ و برینج و ڕۆن و زۆر شتی پێداویست گەیشتە مزگەوت «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ ظرف و ظروف

**قاپوقنجار / qap û qincar/**: ☜ **قاپوقاچاغ**

**قاپوقنجاڕ / qap û qincař/**: ☜ **قاپوقاچاغ**

**قاپۆ / qapo/**: ناو. ١. قاپۆک؛ ئاوماڵک؛ ئەو شتانەی لافاو ڕایداون و خستوونیە کەنار چەم ٢. نیاز؛ ئاتاجی ☰ ١. سیل‌آورد ٢. احتیاج

**قاپۆر / qapor/**: ☜ **قەپو ـ٢**

**قاپۆرەفیشەک / qaporefîşek/**: ☜ **قالك**

**قاپۆڕ / qapoř/**: ☜ **قابلۆخ**

**قاپۆڕە / qapoře/**: ناو. قابۆرە؛ داری لە بەر کۆنی پواو ☰ درخت کُهنسال پوسیده

**قاپۆک / qapok/**: ☜ **قاپۆـ١**

**قاپۆلکە / qapolke/**: ناو. کاسێت؛ قاپیلکە؛

قاپلۆخ؛ بەرگی ڕەق و ئەستووری هەر شتێک زۆرتر بۆ پاراستن و بەرگری 🇮🇷 کاست؛ قاب

**قاپوت** / qapût/: ناو. ١. فەرەنجی؛ فەرەجی؛ پۆشەنی بێباڵی بەرگن ٢. باڵتۆ؛ باڵتە؛ ساقۆ؛ بالاپۆشی لە قوماشی ئەستوور ٣. سێ جارە بردنەوەی یاری مەحبووس لە نەردێندا 🇮🇷 ١. نوعی بالاپوش نمدی ٢. پالتو ٣. سوم برد در بازی محبوس تخته نرد

**قاپووچکە** / qapûçke/: ☜ **قاپولکە**

⊡ **قاپووچکە داگرتن**: ١. تیکەی بەحری لە ماس دان؛ پارووی وەک چەمچە لە ماست گرتن ٢. *[کینایە]* لە باری دەسکەوت و داهاتەوە ئارخەیان بوون ‹لە کۆزی کاران بڕوانە و قاپووچکە لە ماست داگرە! «مەسەل»› 🇮🇷 ١. لُقمەی کفچەیی بە ماست زدن ٢. از لحاظ درآمد آسودەخاطر بودن

**قاپوورە** / qapûre/: ☜ **قاپ**[1] **ـ٤**

**قاپووڕە** / qapûře/: قاپۆڕ؛ قابلۆخ؛ توێکڵە ‹لەو گوللەبارانەدا قاپووڕە مووشەکێک (فیشەکێکی زل) لە بەردێک هەڵبەزییەوە و کەوتە ناومان «هەژار، چێشتی مجێور»› 🇮🇷 پوستە

**قاپولکە** / qapûlke/: ناو. قاپووچکە؛ قاپیلکە؛ قەمچۆک: ١. دەفری زۆر پچووک ٢. پارووی وەک چەمچە بۆ ماست 🇮🇷 ١. ظرف کوچک ٢. لُقمەی کفچەیی برای ماست

**قاپولە** / qapûle/: ناو. گوێزنگ؛ قاپی پێ 🇮🇷 قوزک پا

**قاپە** / qape/: ناو. *[پلار]* قسەی زل و بێمانا 🇮🇷 حرفهای گُندە و بی مُحتوا

**قاپەڕەقە** / qapeřeqe/: ناو. سەری گوێزنگ 🇮🇷 سر قوزک پا

**قاپەکەوڵە** / qapekewłe/: ناو. قەیتەران؛ گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ 🇮🇷 گیاهی دارویی

**قاپی** / qapî/: ☜ **قاپیە**

**قاپیلک** / qapîlik/: ☜ **قاپێلک**

**قاپیلکە** / qapîlke/: ☜ **قاپولکە**

**قاپین** / qapîn/: چاوگ. تێپەڕ. //قاپیت؛ دەقاپی؛ بقاپە// قاپان؛ قاپاندن؛ قاچاندن؛ ڕفاندن 🇮🇷 قاپیدن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەقاپین

**قاپیوان** / qapîwan/: ☜ **قاپچی**[1]

**قاپیە** / qap(i)ye/: ناو. قاپی؛ درگا 🇮🇷 دروازە

**قاپیەوان** / qapyewan/: ☜ **قاپچی**[1]

**قاپێلک** / qapêlik/: ناو. قاپیلک؛ توێخولی بەتاڵی شت 🇮🇷 پوستەی توخالی

**قاپێلکەسەر** / qapêlkeser/: ئێسکەسەر؛ کەللەسەر 🇮🇷 جُمجُمە

**قاپێن** / qapên/: ☜ **قاپان**[2]**ـ١**

**قاپێوان** / qapêwan/: ☜ **قاپچی**[1]

**قات**[1] / qat/: ناو. ١. ئەوەندە؛ ئەندازە؛ بەرانبەر ‹دوو قاتی ئەو دەبێ، عەیب نییە لێ دەترسی؟› ٢. نهۆم ‹خانووەکەی دووقاتە؛ لە قاتی سەرەوە دانیشتووە› ٣. قەد؛ دەست لە بەرگ و نوێن ٤. دەم؛ سات؛ کات ‹ئەو قاتە لاو بووم› ٥. قاد؛ مەیدانی جەنگ و کایە ٦. چین؛ ناو دوو توێ ‹لە قاتی کەواکەیدا شاردبوویەوە!› ٧. قاد؛ خاک؛ زەوی 🇮🇷 ١. برابر ٢. طبقە ٣. دست (لباس و رختخواب) ٤. هنگام ٥. میدان ٦. لا؛ لایە ٧. زمین؛ خاک

**قات**[2]: ناوەڵناو. قاتی؛ قەحت؛ کولپ؛ تایبەتمەندی شتێک کە بە هیچ جۆر دەست نەدا ‹کلاو قات بوو، ئەم تەپکەت ساند؟!› 🇮🇷 قحط

⊡ **قات بون**: قت بوون؛ نەبوون ‹لەبەر حوکمی نیگایا قاتە هوشیار/ هەتا چاوی بکا بڕ، مەستە، هەر مەست «مەحوی»› 🇮🇷 قحط بودن

ـ **قات**[3]: پاشەوشە. نهۆم ‹دووقات؛ چەندقات› 🇮🇷 ـ طبقە

**قاتر** / qatir/: ناو. قانتر؛ ئەستر؛ هەستر؛ هەسەرە؛ ئێستر؛ یەستر؛ هێسر؛ هێستر؛ بزی؛ توڕ؛ چاقری؛

چـاروای دووڕەگـەی لـە نێرەکـەر و مـایین کـە نەزۆک و بەهێزە و بۆ سواری و بار بردن دەبێ ☰ استر؛ قاطر

**قـاترچی** / qatirçî/: نـاو. خەربەنـدە؛ ئولاخـدار ☰ چاروادار

**قاترداشـاغی** / qatirdaşağî/: نـاو. ئاڵـووبخارا؛ جۆرێ هەڵووژەیە وشک کراوەکـەی بـۆ چێشـت دەبێ ☰ آلوبخارا

**قاتغ** / qatiğ/: ناو. سپیایی؛ سـپیاتی؛ شـیرەمەنی ☰ لبنیات

**قات ـ قات** / qat qat/: ئاوەڵناو. ١. تمتمان؛ تمتم ٢. نهۆم لە سەر نهۆم ☰ ١. زمین سنگی طبق ـ طبق ٢. چند طبقه

**قاتڵ** / qatił/: ئاوەڵناو. ١. مرۆکوژ ٢. *[کینایە]* ترش؛ تورش ☰ ١. قاتل ٢. تُرش‌مزه

⊡ **بونه قاتڵی شتێ:** *[پلار]* تەواو خواردن یا لە نێـو بردنی شتێ ☰ تمام چیـزی را خـوردن یـا نـابود کردن

**قاتم** / qatim/: ناو. کاری لێک بەستنی گیاندار ☰ عمل به هم بستن حیوانات

**قاتمـە** / qatme/: نـاو. ١. دامـووس؛ داموەسـک؛ مـووی کلکـی یەکسـم ٢. پرێسـکە؛ پریاسـکە؛ پرێـزگ ٣. گلۆڵـە بـەن ☰ ١. مـوی دُم سـتور ٢. بُقچەی کوچک ٣. گلوله نخ

**قاتمەبەن** / qatmeben/: نـاو. گشتەکی هۆندراو لە داموس (مووی کلکی یەکسم) ☰ قاتمەبند؛ ریسمان موین

**قاتوقڕ** / qat û qiř/: ☜ **قات‌وقڕی**

**قـاتوقڕی** / qat û q(i)řî/: نـاو. قـاتی؛ قـات‌وقـڕ؛ قاتی‌وقڕی؛ قەتی؛ گرانی و گیر نەهاتن (بەتایبـەت بۆ بژیو) ☰ قحطی

**قاتوقەیماخ**/ qat û qeymax/: نـاو. قات‌وقەیماخی؛ نیوەنمەک؛ هەویری زۆر سوێر بـۆ سـەر کـوان ☰ خمیر شور برای نرم کردن دُمل

**قاتوقەیماخی**/ qat û qeymaxî/: ☜ **قات‌وقەیماخ**

**قاتۆر** / qator/: ناو. تەختەی دارەڕا ☰ تخته الوار

**قـاتۆرک** / qatorik/: ناو. ١. لقی هـەرەناسـکی دار ٢. لاسکی لاولاو ☰ ١. شاخەی بسیار نازک درخـت ٢. شاخەی پیچک

**قـاتۆڵی** / qatołî/: ناو. ڕوبی هـەنار؛ ڕب هـەنار ☰ رُب انار

**قاتـە**[١] / qate/: نـاو. ١. گوڵـــی داروو‌جـــان ٢. داسوولکەی خەلە ٣. تێکوڵی چەڵتووک ٤. نیوە؛ نیمە؛ نیڤە «قاتەی بەهار بوو هاتەوە» ☰ ١. خوشەی کدرم ٢. پُرز خوشەی غله ٣. پوستەی برنج ۴. نیمه

**قاتە**[٢]: ئاوەڵـناو. قاتی؛ دڵخۆش؛ ڕازی؛ ڕەزامەند ☰ خوشنود

**قاتەلێوە** / qatelêwe/: ☜ **خاکەلێوە ـ٢**

**قاتەولێوە** / qate w lêwe/: ☜ **خاکەلێوە ـ٢**

**قاتی**[١] / qatî/: ☜ **قات‌وقڕی**

**قاتی**[٢]: ئاوەڵـناو. ١. تێکەڵاو ٢. دڵـخۆش؛ ڕازی ٣. *[مەجاز]* تایبەتمەندی کەسێ کە تێکچووە و خـۆی پێ ڕاگیر نابێ ☰ ١. آمیخته ٢. خوشنود ٣. قاتی

**ـ قـاتی**[٣]: پاشەوشـە. نهـۆمی؛ بـە نهـۆم «قەسـری سێ‌قاتی قەت بینا نەکرد/ هەناسەسـارد بـوو تـا ئـەو ڕۆژەی مرد «قانع»» ☰ طبقه؛ طبقه‌ای

**قاتی‌وقڕی** / qatî w q(i)řî/: ☜ **قات‌وقڕی**

**قاج** / qac/: ناو. ١. کاج؛ کاژ؛ کاژی ٢. ☜ **قاد** ☰ ١. کاج ٢. ☜ **قاد**

**قاجوج** / qacuc/: نـاو. پـەرداخی گڵـێنە ☰ لیـوان سُفالین

**قاچ** / qaç/: نـاو. ١. دوو؛ کلک؛ دووچکە ٢. پا؛ پێ «قاچ، پێڵاوی خۆی ئەناسێتەوە «مەسەل»» ٣. پـووز و بەلـەک ٤. بـەردی بازەڵـێن ٥. جـگ؛ جـک؛ قاپوورە ٦. زەقایی؛ زۆپی ٧. دارێکی دڕکاوییە ☰ ١. دُم ٢. پا ٣. ساق ۴. شنِ بازی ۵. قاب؛ شـتالنگ ۶

برجستگی ۷. درختی خاردار

**قاچاخ**[١] / qaçax/: ناو. قاچاغ؛ قەچاخ: ١. بەچکە حوشتری دووساڵە ٢. کاری دژی دەستووری دەوڵەت ٣. کەسێ کاری دژی دەستووری دەوڵەت دەکا ٤. ماڵ یان شتێ کە کڕین و فرۆشتنی بەرانبەر بە دەستووری دەوڵەت نییە ≚ ١. بچه شتر دوساله ٢. کارِ قاچاق ٣. کسی که کار خلاف قانون انجام می‌دهد ۴. اموال قاچاق

**قاچاخ**[٢]: ئاوەڵناو. قاچاغ؛ قەچاخ: ١. دۆخی کەسێ کە لە ترسی دەوڵەت خۆی شاردۆتەوە ٢. تۆراو؛ تاربووگ ‹ماوەیەکە لێمان قاچاخە› ٣. ڕەوەک؛ قوشقی ٤. ناڕەوا بە پێی دەستوور ≚ ١. تحت تعقیب ٢. رمیده ٣. رموک ۴. قاچاق

**قاچاخ**[٣]: پێرۆ. ← **قاپوقاچاخ**

**قاچاخچی** / qaçaxçî/: ناو. قەچاخچی؛ سەوداگەری ماڵی قاچاخ ≚ قاچاقچی

**قاچاخە** / qaçaxe/: ناو. بێچووە گامێشی دوو ساڵانە ≚ بچه گاومیش دو ساله

**قاچاخی**[١] / qaçaxî/: ئاوەڵناو. نهێنی هاتوو ‹تەلەڤیزیۆنی قاچاخی› ≚ قاچاقی

**قاچاخی**[٢]: ئاوەڵکار. بە شێوەی نهێنی؛ بە دزی ‹قاچاخی دێت و دەڕوا› ≚ قاچاقی

**قاچاغ** / qaçağ/: ☜ **قاچاخ**

**قاچان**[١] / qaçan/: چاوگ. ڕا کردن؛ هەڕا کردن ≚ دویدن

**قاچان**[٢]: ئاوەڵناو. بزۆز؛ نائارام ≚ ناآرام

**. قاچان**[٣]: پاشەوشە. شتڕفێن ≚ رباینده

**قاچاندن** / qaçandin/: چاوگ. ١. ☜ **قاپین** ٢. ڕاکردن ≚ ١. ☜ **قاپین** ٢. دویدن

**قاچانێ** / qaçanê/: ☜ **قاپان**[١]-١

**قاچاو** / qaçaw/: ناو. زەوینی دژاو؛ زەوینی بەرز و نزم کە ئاودێری دژوارە ≚ زمین پست و بلند که آبیاریش دشوار است

**قاچقوڵە** / qaçqułe/: ئاوەڵناو. پێکورت؛ پاکوڵ؛ پێکوڵ ≚ پاکوتاه

**قاچک** / qaçik/: ناو. ١. پاچەی حەیوان لە چێشتی سەروپێدا ٢. خێزەرە؛ ئالاش؛ هەژگ؛ گەڵا و چڵووی سەر دارەڕا ٣. چرپی هەڵاشی خانوو؛ چرۆی سەر بانەڕا کە وە بن پووش و پەڵاش دەدرێ و قوڕەبان دەکرێ ٤. قاچ؛ دوو؛ کلک ٥. قارچک؛ کارگ ٦. قاژک؛ جۆرێک جەوی لە ڕیشەی شنگ ≚ ١. پاچه ٢. انبیره ٣. چوبک‌های انبیره ۴. دُم ۵. قارچ ۶. قندرون؛ نوعی سقز گیاهی

**قاچنای** / qaçnay/: چاوگ. قاپاندن ≚ قاپیدن

**قاچوق** / qaçoq/: ☜ **کەوچك**

**قاچوقول** / qaç û qul/: ناو. قولوقاچ؛ لنگ و لەتەر؛ پا و پل ≚ از زانو به پایین

**قاچوقوچ** / qaç û qûç/: ناو. سیرمەخۆری؛ شرەخۆری ≚ دلەدُزدی

▣ **قاچ و قوچ کردن**: بە فڕوفێڵ دزی کردن ≚ دلەدزی کردن

**قاچۆڕ** / qaçoř/: ناو. کاری بژاردنی مەڕوماڵات بۆ پووشانە حەساو کردن ≚ سرشماری دام بە قصد اخذ مالیات

**قاچو** / qaçû/: ☜ **قەمچان**

**قاچەشرمەکێ** / qaçeşirmekê/: ناو. شەڕەپێلاقە ≚ لگدبازی

**قاچەفڕێ** / qaçef(i)řê/: ناو. پەلەقاژێ؛ کاری دەست و پێ لێدان بۆ دەرباز بوون ≚ تلاش مذبوحانه

**قاچی** / qaçî/: ناو. ١. ☜ **قەیچی** ٢. ڕووبەڕوو؛ بەرامبەر ٣. پێلاو؛ پاپۆش ≚ ١. ☜ **قەیچی** ٢. روبرو ٣. کفش

**قاچیای** / qaçyay/: چاوگ. ڕفێنران ≚ قاپیده شدن

**قاچین** / qaçîn/: ☜ **قاچینەوە**

**قاچینەوە** / qaçînewe/: چاوگ. قاچین؛ پاچین؛ پاچینەوە؛ لابردنی مووی سەر بەتایبەت بە قەیچی 🇮🇷 تراشیدن موی سر با قیچی

**قاچێن** / qaçên/: ناو. ١. ☜ قەمچان ٢. ☜ قاپان^٢-١

**قاحبە** / qahbe/: ناو. *[ناشیرین]* قەحبک؛ قەحبە؛ قەخپە؛ قەهبک؛ بشکێ؛ بەستۆکە؛ سۆزانی؛ جوونە؛ گوزلی؛ بەدناو؛ ژەە 🇮🇷 قحبە

**قاحبەخانە** / qahbexane/: ☜ جندەخانە

**قاخ** / qax/: ئاوەڵناو. چەماو؛ کۆم؛ داهاتوو 🇮🇷 خمیده

**قاخڵی** / qaxlî/: ناو. قافلی؛ قاقڵی؛ کاخڵی؛ کاژێلە؛ کاژێرە؛ گوڵەزەردە؛ گیایەکی لاسکسپی دەسچێنە، بە گەڵای هێلکەیی ساف و لقی ڕاستەوە کە گوڵێکی نارنجی، زەرد یان سوور دەکا، بۆ تام و جوانی لە کولێرەی دەدەن 🇮🇷 کاجیرە؛ گل رنگ

**قاخڵیبەهارە** / qaxlîbehare/: ناو. شەماڵ گێر؛ گیایەکە لە بنەماڵەی «چەتریی‌ەکان» بە ساقەتەی ئەستوورەوە کە یەک تا دوو میتر باڵا دەکا 🇮🇷 انجدان روقی

**قاخنات** / qaxnat/: ☜ قاغنات

**قاخناک** / qaxnak/: ☜ قاغنات

**قاخە** / qaxe/: ☜ قەدەغە

**قاد** / qad/: ناو. قاج: ١. زەمین؛ زەوی؛ هەرد ٢. خاک؛ قات 🇮🇷 ١. زمین ٢. خاک

▣ **قادا شەڕێ**: مەیدانی جەنگ 🇮🇷 میدان جنگ

**قادبین** / qadbîn/: ئاوەڵناو. قادناس؛ پسپۆڕ و شارەزای جەنگ 🇮🇷 جنگاور

**قادرخانی** / qadirxanî/: ناو. جۆرێ شووتی زۆر شیرینە، تووەکەی سپییە 🇮🇷 نوعی هندوانە

**قادرمە** / qadirme/: ناو. قاڵدرمە: ١. پلە؛ پلەکان ٢. پەیژە؛ نەردیوان 🇮🇷 ١. پلکان ٢. نردبان

**قادڤین** / qadvîn/: ئاوەڵناو. قادۆ؛ ئازا لە شەڕ 🇮🇷 جنگندە

**قادناس** / qadnas/: ☜ قادبین

**قادۆ** / qado/: ☜ قادڤین

**قادوول** / qadûl/: ناو. جەڕە و کووپەی زارتەنگ (بەتایبەت بۆ جێ پەنیر) 🇮🇷 بستوغە

**قادی** / qadî/: ناو. گەمەیەکی زارۆکانە 🇮🇷 از بازی‌های کودکان

**قادێ** / qadê/: ناو. ١. گۆڕەپان؛ زەوینی تەخت ٢. مەیدانی کایە 🇮🇷 ١. زمین هموار ٢. میدان بازی

**قار**^١ / qar/: ناو. ١. نقار؛ خاک؛ تۆر؛ توور؛ مت؛ جوونگ؛ بێزاری؛ دوزاخە؛ جاڕزی؛ دڵئێشاوی وا کە ببێتە هۆی پێکەوە قسە نەکردن یان نەمانی پێوەندی دۆستی ‹لوتفێ بە حالی من کە! وتم؛ ئەو وتی بە قار/ تۆ شێخی باخودا و ئەمن شۆخی ناخودا «مەحوی»› ٢. خەم؛ خەفەت ٣. دەی فەقێیان؛ جۆرێ حیسابی بە قامکان ٤. جیرەی فەقیران ٥. توانا؛ تاقەت ٦. غەزەب ‹حەک خوا قارت لێ گرێ هەی!› 🇮🇷 ١. قهر ٢. غم ٣. نوعی حساب انگشتی ٤. جیرەی روزانەی فُقرا ٥. تاب و توان ٦. غضب

▣ **قار چوونە سکەوە**: *[مەجاز]* زۆر تووڕە و ناڕەحەت بوون 🇮🇷 کینە بە دل گرفتن

**قار کردن**: تۆران و نێوان بڕان 🇮🇷 قهر کردن

**چوون بە قارا**: قار کردن؛ تۆران ‹نەمردمایە هەتا ئەمزانی بۆچی/ چ ڕووی داوە لە من وا چوو بە قارا «عارف عورفی»› 🇮🇷 قهر کردن

**قار**^٢: ئاوەڵناو. تۆراو؛ قارکردوو 🇮🇷 قهر

▣ **قار بوون**: ‹لە پارەوە تا ئێستا قارن› 🇮🇷 قهر بودن

**قارا** / qara/: پێرۆ. ← ئاراوقارا

**قاراغ** / qarağ/: ☜ قەراخ

**قاراو** / qaraw/: ناو. شەونم؛ ئاونگ 🇮🇷 شبنم

**قارپچۆک** / qarp(i)çok/: ☜ قارووچ

**قارپوز** / qarpuz/: ناو. ١. گندۆرە؛ کاڵەک؛

خرچەی گەیشتوو ٢. سەرکلاوەی لامپا ✉ ١. خربُزه ٢. آباژور

**قارپۆز** / qarpoz/: ناو. زۆپی پێشەوەی زین ✉ قاچ زین

**قارت** / qart/: ناو. ددانە؛ ددانۆک؛ دالبڕ؛ دیانە ✉ دندانە

**قارچ** / qarç/: ☜ **قارچك ـ١**

**قارچک** / qarçik/: ناو. ١. کارگ؛ خارچ؛ خارچک؛ قارچگ؛ قاچ؛ قارچ؛ قاچک؛ ڕووەکی بێ‌ڕەگ و قەد و گەڵا و بێ‌ماکی کلورۆفیل کە ناتوانێ بۆ خۆی خواردەمەنی دابین بکا، لە سەر خاک و گیا و لەشی زیندەوەر یان پاشماوەی مردوو، بە یارمەتی تیشکی خۆر، وەکوو باکتری و کەڕوو دەژی ٢. ئێسقانی کلینچکە؛ پێشەی جوچکەسمت ✉ ١. قارچ ٢. دنبالچه

**قارچکەدارانە** / qarç(i)kedarane/: ناو. خێزانە قارچکێکە وەک شی‌کەرەوەی سەرەتایی لە سەر دار، بەتایبەت داری شۆدار دەڕوێ، کلاوێکی پان و بارۆشەیی هەیە ✉ قارچ صدفی

**قارچکەگولانە** / qarç(i)kegulane/: ناو. قارچکەمارانە؛ گوپسک؛ جۆرێ کارگە بۆ خواردن ناشێ ✉ نوعی قارچ سمی

**قارچکەمارانە** / qarç(i)kemarane/: ☜ **قارچکەگولانە**

**قارچکی** / qarç(i)kî/: ناوەڵناو. کارگی: ١. سەر بە قارچک ‹نەخۆشی قارچکی› ٢. بە شێوەی قارچک ‹ڕووەکی قارچکی› ✉ ١و٢. قارچی

**قارچگ** / qarçig/: ☜ **قارچك ـ١**

**قارچەجنانە** / qarçec(i)nane/: ناو. پوەڵەکارگ؛ قارچکی دار؛ قارچکە جنۆکانە ✉ غاریقون؛ قارچ درختی

**قارخ** / qarix/: ناو. کەرتی سەوزی تێدا چاندن ✉ کَرتِ سبزیکاری

**قارژنگ** / qarjing/: ☜ **قرژانگ**

**قارس**[١] / qars/: ناو. کاری دادروون بۆ کورت کردنەوە ✉ عمل بردوختن برای کوتاه کردن

⊡ **قارس کردن**: کورت کردنەوە بە دروومان ✉ کوتاه کردن به روش دوخت

**قارس**[٢]: ناوەڵناو. قەڵس: ١. تووڕە ٢. جاڕز ✉ ١. خشمگین ٢. پریشان

⊡ **قارس بوون**: جاڕز بوون ✉ پریشان شدن

**قارس کردن**: جاڕز کردن ✉ پریشان کردن

**قارسەقول** / qarsequl/: ☜ **قەرسەقول**

**قارسی** / qarsî/: ناو. پەسڵان؛ ڕۆژی قیامەت؛ ڕۆژی سەلا ✉ روز رستاخیز

**قارغ** / qariğ/: ناوەڵناو. دوورەتاو؛ لە ڕۆژدا تاریک (بۆ ژوور دەگوترێ) ✉ تاریک در روز (اتاق)

**قارقارە** / qarqare/: ناو. قارەسەهۆڵ؛ لەتە سەهۆڵی دەگەڵ لافاوی بەهار ✉ تکه‌های یخ شناور در سیلاب بهاری

**قارقومە** / qarqume/: ناو. گیایەکە دەیخۆن ✉ گیاهی خوراکی

**قارلەزگ** / qarlezig/: ناوەڵناو. قینەون؛ بەقین؛ قین‌لەدڵ ✉ کینه‌توز

**قارنان** / qarnan/: ناوەڵناو. پنتی؛ ڕژد؛ چکووس؛ چکوود؛ ڕەزیل؛ سەقیل ✉ خسیس

**قارۆت** / qarot/: ناو. کلافەی دەزوو ✉ کلاف نخ

**قارووتک** / qarûtik/: ناو. قورقرۆک؛ کەڕەواڵە؛ سەمانەک؛ هەوێردە ✉ بلدرچین

**قارووچ** / qarûç/: ناوەڵناو. *[پلار]* قارپچۆک؛ قاریت؛ قاڕقاڕۆک؛ قاروعەم؛ لەڕ و لاواز ✉ لاغرمُردنی

**قارووش** / qarûş/: ناو. گیایەکە ✉ گیاهی است

**قارووشە** / qarûşe/: ناو. گەسک لە چیلکەدار؛ گزگ لە تووڵ ✉ جاروی ترکه‌ای

**قاروونە** / qarûne/: ناو. ١. کرمی میوەی وشک ٢. مێرووی وردی خوری‌خۆر ✉ ١. کرم میوه ٢. بید؛

حشرەی پشم‌خوار

**قارەمان**[١] / qareman/: ناو. قـەرەمان؛ پاڵـەوان؛ پەلەوان: ١. کەلەمان؛ قادڤـین؛ بـەتڵ؛ کۆپـەک؛ گـورد؛ کەسـێ کـە لـە وەرزش، کێبـەرکێ یـان شەڕدا سەر دەکەوێ ٢. کەسـایەتی سـەرەکی و هەرەگرینگی داستان، شانۆنامە یان فیلمنامـە ☰ ١و٢. قهرمان

**قارەمان**[٢]: ئاوەڵناو. قەرەمان؛ دلێر؛ ئازا ☰ شُجاع

**قارەمانانە**[١] / qaremanane/: ئاوەڵناو. وەک قارەمان ‹شەڕی قارەمانانەی پێشمەرگە› ☰ قهرمانانه

**قارەمانانە**[٢]: ئاوەڵکار. بە شێوەی قارەمان ‹قارەمانانە لە خاک و نیشتمانی بەرگری کرد› ☰ قهرمانانه

**قارەمان پەروەری** / qaremanperwerî/: ناو. ١. کار و ڕەوتی بار هێنان و پێگەیاندنی قارەمانان ٢. ڕەوتی سەرنج ڕاکێشـان و دنـە دانی خەڵـک بـۆ شـوێن کەوتنی (پتر خەیالی) ☰ ١و٢. قهرمان‌پروری

**قارەوانە** / qarewane/: ناو. جۆرێ دەفری پچووکی مسی بۆ شێو تێ‌کردن ☰ نوعی ظرف کوچک مسی

**قـاری** / qarî/: نـاو. مرۆڤـێ کــە دەقێـــک دەخوێنێتەوە، بەتایبەت قورئان‌خوێن ☰ قاری

**قاریت** / qarît/: ☜ **قاروچ**

**قاریش** / qarîş/: ☜ **قایش ـ٤**

**قارین** / qarîn/: چاوگ. ١. توانین؛ کارین؛ تـانین؛ لە دەست هاتن ‹ئـەز قـارم فـێ کـارێ بکـەم› ٢. پاڕانەوە؛ لالانەوە ☰ ١. توانستن ٢. لابـه و التمـاس کردن

**قاڕ**[١] / qař/: ناو. ١. نانی تۆپێن؛ کاری لێدانی تۆپ لە تۆپێندا ٢. شوورەیی؛ عـەیب ☰ ١. ضـربەی بـا چوب به توپِ بازی ٢. عیب

**قاڕ**[٢]: ئاوەڵناو. ئارام؛ ئۆقرەگرتوو ☰ آرام

**قاڕ**[٣]: دەنگ. دەنگی بەرزی باڵدار و پەز ☰ صـدای بلند پرنده و گوسفند

**قاڕ**[٤]: پێرۆ. ← **قیروقاڕ**

**قاڕاندن** / qařandin/: چـاوگ. تێنەپـەڕ. //قاڕانـدت؛ دەقاڕێنی؛ بقاڕێنە// ١. قـاڕە کـردن ٢. قیڕەوهـەرا کردن؛ قیڕاندن ☰ ١. بـع ـ بـع کـردن ٢. دادوقـال کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەقاڕاندن

**قاڕقـاڕۆ** / qařqařo/: ئاوەڵـناو. زیقـەزیق‌کـەر ☰ جیغ‌جیغو

**قاڕقـاڕۆک**[١] / qařqařok/: نـاو. ١. ☜ **قـالاو** ٢. *[بلار]* هەلالەکەر؛ جاڕکێش؛ کەسێ کـە بـۆ شـت فرۆشتن هەرا دەکا ☰ ١. ☜ **قالاو** ٢. جارچی

**قاڕقـاڕۆک**[٢]: ئاوەڵـناو. ١. ☜ **قـاروچ** ٢. تایبەتمەندی مرۆ یا باڵدارێ کە زۆر دەقیڕێنێ ☰ ١. ☜ **قاروچ** ٢. جیقو (انسان یا پرنده)

**قاڕقاڕە** / qařqaře/: ناو. جۆرێ چەرخ بـۆ کایـەی منالان ☰ نوعی چرخ بازی بچەها

**قاڕقـاڕێن** / qařqarên/: نـاو. قـاڕێ؛ قـاڕێن؛ قـاڕە؛ یاری قاڕێن کە بە تۆپێکی بچووک لە وردە مووی ئاژەڵ دەکرێ ☰ توپ بازی با توپ کوچک از مـوی حیوانات

**قـــاڕن** / qařin/: ئاوەڵـــناو. زۆر بەزیقـــــەزیق و هەراوهوریا ☰ شلوغ و پرهیاهو

**قاڕنج** / qařinc/: ناو. ١. قاڕنجە؛ پەراوێزی بـەرگ و شمەک ٢. بەنی بابۆڵەپێچ ☰ ١. سجاف ٢. بنـد قُنداق‌پیچ

**قاڕنجە** / qařince/: ☜ **قاڕنج ـ١**

**قاڕنداشی** / qařindaşî/: نـاو. جۆرێـک تووتنـە ☰ نوعی توتون

**قاڕنگە** / qařinge/: ناو. شار لـە یـاری تۆپێنـدا ☰ سرِ میدان توپ بازی با چوب

**قاڕنە** / qařne/: ناو. تۆپی بچووکی دروستکراو لـە خوری و موو بۆ یاری قاڕقـاڕێن ☰ تـوپ کوچـک ساخته شده از موی حیوانات برای بازی

**قاڕوعەم** / qař û 'em/: ☜ **قاروچ**

**قاڕوقوڕ** / qař û qûř/: دەنگەناو. دەنگی تێکەڵاوی مەڕ و بزنی زۆر ☰ غوغای گله

**قاڕوون**[1] / qařûn/: ناو. ۱. [کینایە] مرۆی زۆر دەوڵەمەند ۲. بێشە و زەمەند ☰ ۱. آدم ثروتمند ۲. بیشه و نیزار انبوه

**قاڕوون**[2]: ئاوەڵناو. زۆر؛ زەحف ☰ زیاد

**قاڕە**[1] / qaře/: ناو. ۱. قاڕقاڕێن؛ جۆرێ تۆپێن ۲. گێژی؛ وری ۳. قوڕنە ☰ ۱. نوعی توپبازی ۲. گیجی ۳. قاره

**قاڕە**[2]: دەنگەناو. دەنگی هاواری بڕێک لە گیانەوەران (وەک: پەز، مراوی، سی، قەل و ...) ‹نە قاڕەی سی و چریکەی باز و پەرکوور/ نە دەنگی ئاسمانی و شادی شالوور «هێمن»› ☰ صدای بلند برخی جانداران

**قاڕەسەرێ** / qařeserê/: ناو. سەرەگێژە و کاسی لە بەر گەرما ☰ سرگیجه از گرما

**قاڕەسەهۆڵ** / qařesehoł/: ☜ قارقارە

**قاڕەقاڕ** / qařeqař/: دەنگەناو. ۱. قاڕ ـ قاڕ؛ دەنگی قەلەڕەش ۲. کارەکاڕ؛ دەنگی تێکڕایی پەز ☰ ۱. قارقار ۲. صدای دستەجمعی گوسفندان

⊡ **قاڕەقاڕ کردن**: قڕاندن ☰ قار ـ قار کردن

**قاڕی** / qařî/: ناو. پیرێژنی فەرتووت ☰ پیرزن لکنته

**قاڕیایۆ** / qařyayo/: چاوگ. دەنگ هەڵبڕینی بزن ☰ قاروقور کردن بُز

**قاڕێ** / qařê/: ☜ قاڕقاڕێن

**قاڕێن** / qařên/: ☜ قاڕقاڕێن

**قاز** / qaz/: ناو. غاز؛ خاسەسی؛ باڵندەیەکی مەلەوانە، لە خێزانی قازەکان و تۆرەمەی وەردەک، نزیک ۷۵ تا ۸۵ سانتیمیتر دەبێ، کۆچەرە و بە دەستە دەگەڕێن و لە ناو قامیش و جەگەندا هێلانە ساز دەکەن ☰ غاز خاکستری

⊡ **قاز لەوەڕاندن**: [کینایە] پا لە پەین دان؛ مێش خەساندن؛ بێ کاروبار بوون ☰ غاز چراندن

**قازاخ**[1] / qazax/: ناو. چەکداری دەوڵەت ☰ نظامی

**قازاخ**[2]: ئاوەڵناو. ۱. پاک؛ خاوێن ۲. زەریف؛ پەسند ۳. عازەب؛ سەڵت؛ بێهاوسەر ☰ ۱. پاکیزه ۲. زیبا ۳. مُجرد

**قازان** / qazan/: ناو. ۱. ☜ قازانگ ۲. ☜ قازانج

**قازانج** / qazanc/: ناو. قازان؛ قانجاز؛ قانزاج؛ قانزان؛ قەزانج؛ دەسکەوت؛ بەهرەی سەودا ☰ سود معامله

⊡ **قازانج کردن**: بەهرە دەسکەوتن ☰ سود بردن

**قازانچە** / qazançe/: ناو. بەرۆشی چکۆلە ☰ دیگ مسی کوچک

**قازانچی** / qazançî/: ناو. قەزانچی؛ مسگەر ☰ مسگر

**قازانقوڵفی** / qazanqułfî/: ناو. قازانقۆڵی؛ دەرزی بەرکۆژە ☰ قزنقُفلی

**قازانقۆڵی** / qazanqołî/: ☜ قازانقوڵفی

**قازانگ** / qazang/: ناو. قازان؛ بەرۆش ☰ دیگ مسی

**قازانەسەر** / qazaneser/: ناو. [باوەڕی کۆن] دێوی خەیاڵی کە منداڵیان پێ دەترساند ☰ لولوخورخوره

**قازفڕەفڕ** / qazf(i)řefiř/: ناو. گەمەیەکە منداڵان دەیکەن ☰ از بازیهای کودکان

**قازڤان** / qazvan/: ☜ قازەوان

**قازقولەنگ** / qazquleng/: ☜ قازیقوڵنگ

**قازقولینگ** / qazqulîng/: ☜ قازیقوڵنگ

**قازک** / qazik/: ناو. مەنجەڵی پچووکی قوڵفدار؛ بەرۆشی پچووکی بە دەسک ☰ دیگ کوچک دستەدار

**قازلاخ** / qazlax/: ☜ قازڵاخی

**قازڵاخ** / qazłax/: ☜ قازڵاخی

**قازڵاخی** / qazłaxî/: ناو. قازلاخ؛ قازلاخ؛ قازەلاخ؛ قازەلاخ؛ قازەلاخی؛ چوڕە؛ کلاوکوورە؛ سۆفیەقیتە

☰ چکاوک

**قازم / qazim**/: ناو. بەن لە کووروو؛ ڕیس لە تووکەوردەی بن خوری ☰ ریس از کُرک

**قازمانە / qazmane**/: ناو. جۆرێ ئالووچە ☰ نوعی آلو

**قازمە / qazme**/: ☜ قولنگە

**قازمەکی / qazmekî**/: ناو. بەرێکی پچووکی دار مازوو ☰ ثمری ریز از مازوج

**قازوقولەنگ / qaz û quleng**/: ☜ قازیقولنگ

**قازەقوڕە / qazequře**/: ناو. میلەگورگانە؛ گیایەکە ☰ گیاهی است

**قازەلاخ / qazelax**/: ☜ قازلاخی

**قازەڵاخ / qazełax**/: ☜ قازلاخی

**قازەڵاخی / qazełaxî**/: ☜ قازلاخی

**قازەڵانە / qazełane**/: ناو. سی کوێرە؛ باڵندەیەکە لە تیرەی قازەکان ☰ غاز پا زرد

**قازەن / qazen**/: ناو. دەسک و گوڵ لە چەڵتووکجاڕ ☰ عمل دسته کردن خوشەی شالی

**قازەوان / qazewan**/: ناو. قازڤان؛ شوانی قاز ☰ غازچران

**قازی / qazî**/: ناو. دادوەر؛ داوەر؛ دادپرس؛ کەسێ کە بە شکاتی خەڵک ڕادەگا ☰ قاضی

**قازیاخە / qaz(i)yaxe**/: ناو. قازیانە؛ لێشرێ؛ مەوەنوس؛ گیابەڵەکی؛ گیادۆکولیو؛ ڕووەکێکی بەهاری بە گەڵای پان و گوڵی سپی و بەری ورد و ڕەشەوە، بۆنخۆشە و بە کوڵاوی دەخورێ و بۆ دەرمانی نەخۆشی پێستیش بە کار دێ ☰ قازایاغی

**قازیانە / qaz(i)yane**/: ☜ قازیاخە

**قازیسوور / qazîsûr**/: ناو. کەرەنگ؛ سوورەقورینگ ☰ فلامینگو

**قازیقولەنگ / qazîquleng**/: ☜ قازیقولنگ

**قازیقولنگ / qazîquling**/: ناو. قازقولینگ؛ قازقولەنگ؛ قازیقولینگ؛ قازیقولەنگ؛ قازیقوڵەنگ؛ قورنگ؛ قورینگ؛ قولنگ؛ قولینگ؛ قولنگ؛ قولەنگ؛ قولینگە؛ قەتارقولینگ؛ شینەقورینگ؛ کولنگ؛ قورینگی گۆزەڵێ؛ تۆرەمە باڵندەیەکی کێوین، بە لەش و مل و باڵ و لاقی درێژ و دەندووکی بڵیند و ئەستوورەوە، لە سەر زەوی هێلانە دەکەن و دوو جۆریان هەیە: شینەقورینگ و قرقڕ ☰ دُرنا

**قازیقوڵەنگ / qazîqułeng**/: ☜ قازیقولنگ

**قازیقوڵینگ / qazîqułîng**/: ☜ قازیقولنگ

**قاژ [1] / qaj**/: ناو. ١. ☜ قەلەڕەش ٢. ☜ قاش ـ٢و٣ ٣. نقێم؛ قاش؛ خاش؛ بەردی ڕازاوەی سەر ئەنگوستیلە ٤. برۆ؛ بەرم؛ خەتەمووی بان چاو ☰ ١. ☜ قەلەڕەش ٢. ☜ قاش ـ٢و٣ ٣. نگین ۴. ابرو

**قاژ [2]**: پێرۆ. ← قیژوقاژ

**قاژدەرە / qajdere**/: ☜ قەلەڕەش

**قاژر / qajir**/: ئاوەڵناو. زۆر گرینۆک ☰ همیشه گریان

**قاژقاژ [1] / qajqaj**/: ☜ قاژقاژە

**قاژ ـ قاژ [2]**: ☜ قاش ـ قاش

**قاژقاژە / qajqaje**/: ناو. قاژقاژ؛ کەندەسمە؛ ڕەنگاڵە؛ ڕەنگرێژە؛ هەنگچنە؛ هەنگخۆرە؛ باڵدارێکی ڕەنگاوڕەنگی لە چۆلەکە گەورەترە، زۆر خێرا دەفڕێ، ئافەتی گیانی هەنگە و ڕۆژێ تا چل دانەیان لێ دەخوا ☰ زنبورخوار

**قاژک / qajik**/: ناو. ١. بنێشت؛ چەققەی جاوین ٢. چەقە؛ قاچک؛ جۆرێک جەوی لە ڕیشەی شنگ ٣. *[شوورەیی]* قەوچە؛ کاری دەم لێکدانی ماکەر ☰ ١. سقز بُنه ٢. آدامس ٣. عمل دهان باز و بسته کردن ماده خر

⊡ **قاژک چوون** *[شوورەیی]* قەوچە کردن؛ دەم لێکدانی ماکەر لە ژێر نێرەکەردا ☰ دهان باز و

بسته کردن ماده خر هنگام جفتگیری

**قاژنگ** / qajing/: ☜ **قرژانگ**

**قاژنگە** / qajinge/: ناو. مڵ؛ ملە؛ جۆبرک 🇮🇷 آبدُزدک

**قاژنگی** / qajingî/: ☜ **قرژانگ**

**قاژ و قیژ** / qaj û qîj/: دەنگەناو. قیژ و هۆڕ ‹لە قاژ و قیـژان لـە پەلـەقاژان/ دەنـووک داچـەقان دلان دەهاژان «حەقیقی»› 🇮🇷 داد و فغان

**قاژو** / qajû/: ☜ **قەلەڕەش**

**قاژومەڕە** / qajûmeře/: ناو. قاژی دندووک سوور؛ باڵـندەیەکە لـە تۆرەمـەی قـەل، نزیـک ٤٠ سـانتیمیتـرە، پـەڕ و باڵـی کـەوەی بریقـەدار، دندووکی درێژ و سوور و خوارە، لە فڕیندا بەهێزە، لە کونەبەرد، لێواری هەڵـدێر و نێـو ئەشـکەوتاندا هێلانە دەکا 🇮🇷 زاغ نُک سُرخ

**قاژە** / qaje/: دەنگەناو. دەنگی لە چەشنی دەنگـی قاژ و ... ‹قاژەی سیاقاژ دەنگ بولبول نییـە/ باخـان بێسەمەر ئیمساڵ گوڵ نییە «فولکلۆر»› 🇮🇷 قار

**قاژەسیاوێ** / qajes(i)yawê/: ☜ **قەلەڕەش**

**قاژەقاژ** / qajeqaj/: دەنگەناو. دەنگـی زۆری قـاژوو 🇮🇷 سر و صدای زیاد زاغ و کلاغ

**قاژی** / qajî/: ناو. ١. ☜ **قەلەڕەش** ٢. قازی چینا 🇮🇷 ١. ☜ **قەلەڕەش** ٢. غاز وحشی

**قاس** / qas/: ناو. ١. ئەندازە؛ شۆ؛ ڕادە ‹چەند قاسی تۆ کاری کردووە› ٢. دەم؛ سات ‹ئەو قاس چاڤنێری تە بووم› 🇮🇷 ١. اندازە ٢. آن؛ دم

**قاسپاندن** / qaspandin/: چاوگ. تێپەڕ. //قاسپاندت؛ دەقاسپێنی؛ بقاسپێنە// قاسپە کردن 🇮🇷 خواندن کبک

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەقاسپاندن

**قاسپە** / qaspe/: دەنگ. دەنگی خوێندنی کـەو 🇮🇷 صدای کبک

**قاسپەقاسپ** / qaspeqasp/: دەنگەناو. قاسـپەی لـە دووی یەک ‹قاسپەقاسپی کـەو شـەو لـە کـەلاوان/ تۆمەز یە لەیلە مەجنوونیەلاوان «فولکلۆر»› 🇮🇷 صدای پیاپی کبک

**قاسک** / qas(i)k/: ناو. لاسـکی گیـا؛ نێـوان بـن و گوڵی گیا 🇮🇷 ساقەی گیاه

**قاسڵوانگ** / qasiłwang/: ناو. سـێروو؛ گـاوانی 🇮🇷 سار

**قاسناخ** / qasnax/: ☜ **قسناخ**

**قاسناغ** / qasnağ/: ☜ **قسناخ**

**قاسو** / qasû/: ناو. باوێلکە؛ قاسید؛ بایلکە؛ باوێلـێ 🇮🇷 قاصدک

**قاسە** / qase/: نـاو. ١. گاسـنووق؛ گاسـنۆق؛ گاوسنۆق؛ سندووقی قورس و قـایم لـە پـۆڵا، بـۆ هەڵگرتنی پارە و بەڵگەی گرینگ ‹قاسەت لە پارە ئاخنیوە/ زۆربـەی زێـڕە و کـەمـی زیـوە «هـەژار، بـۆ *کوردستان*»› ٢. قوفڵ؛ قوڵـف 🇮🇷 ١. گاوصـندوق ٢. قُفل

**قاسید** / qasîd/: ناو. هەواڵبەر؛ شاندیار؛ شاندیەک؛ شاندۆخ؛ قاسوو؛ پەیک؛ ڕاسپاردە؛ چەوار 🇮🇷 پیک؛ قاصد

**قاش** / qaş/: ناو. ١. پێڵە؛ کەوانە؛ پەل وەک نیـوە جەغز ٢. قاژ؛ هەڵدڕاویی یان قەڵشتی قـووڵ لـە شـتێکدا کـە ناوەکـەی لێـوە دیـار بـێ ٣. قـاژ؛ بڕەیەک لـە میـوەی بێسـتان ‹بـرا! خـۆ پیـاوەتی نەبڕاوە. ناکا لە سەر قاشێک شووتی بـە گژمـدا بـێن! «هەژار، چێشتی مجێـور»› ٤. خـاش؛ قـاژ؛ نقـێم؛ بەردی ئەنگوستیلە ٥. پانپانۆکە؛ پانپانۆکێ؛ کاری خـۆ بـە یـەکتر ڕەحـەت کـردنی ژنـان ٦. ☜ **قـەلـەڕەش** ٧. جـۆرێ مـووررووی سـێ گۆشـە و گەورەیە لە ملوانکەدا ٨. دەسـتەگیرەی کورتـان 🇮🇷 ١. نیمدایـره ٢. شـکاف ٣. قـاچ؛ بـرش از میـوەی پالیزی ۴. نگین ۵. کارِ طبق زدن ۶ ☜ **قەلـەڕەش** ۷. نوعی مُهرەی زینتی ۸. برجستگی جلو پالان

⊡ **قاش بردن**: تلیشیان؛ شـەق بـردن 🇮🇷 شـکافته

شدن

**قاش کردن:** قاژ کردن؛ له‌ت کردن بـه بـڕین 🇮🇷 قاچ کردن

**قاشاخ / qaşax/:** ناو. ١. لاسکی گه‌نمه‌شامی ٢. گیایه‌که له که‌نگـه‌ر ده‌کـا 🇮🇷 ١. ساقه‌ی بـلال ٢. گیاهی شبیه کنگر

**قاشاغ / qaşağ/:** ☜ **قاشاو**

**قاشاق / qaşaq/:** ☜ **قاشاو**

**قاشاو / qaşaw/:** نـاو. قاشـاغ؛ قاشـاق؛ قه‌شـاخ؛ قه‌شاغ؛ قه‌شـاو؛ قه‌شـاوش؛ قه‌شـاویش؛ قه‌شـه‌و؛ قه‌شۆ؛ ڕنه‌ک 🇮🇷 قشو

**قاش ـ قاش / qaş qaş/:** ئاوه‌لناو. قاژـ قاژ؛ له‌تـله‌ت به بڕان 🇮🇷 قاچ ـ قاچ

**قاشک / qaşik/:** ناو. ١. تێخولی دار ٢. پرزه‌ی دار 🇮🇷 ١. پوسته‌ی درخت ٢. الیاف درخت

**قاشگ / qaşig/:** نـاو. په‌ترۆک؛ پـه‌ترۆ؛ قرتماخـه‌ی سه‌ر برین 🇮🇷 کبره‌ی زخم

**قاشل / qaşil/:** ☜ **قاشول**

**قاشم / qaşim/:** ناو. گیایه‌کی بۆنخۆشه 🇮🇷 گیـاهی خوشبو

**قاشنه / qaşne/:** ناو. قاشـه؛ قه‌شه‌ماسـی؛ سـووره ماسی؛ جۆرێ ماسی پووله‌که‌زه‌رد 🇮🇷 نوعی ماهی

**قاشوان / qaşwan/:** نـاو. قاشوانێ؛ بازی گـۆیێن 🇮🇷 گوی بازی

**قاشوانێ / qaşwanê/:** ☜ **قاشوان**

**قاشوخ / qaşux/:** ☜ **که‌وچك**

**قاشۆ / qaşo/:** ناو. ١. کاشۆ؛ داری سـه‌رچه‌ماو بـۆ گۆ بـازی ٢. شـه‌قه‌مێو؛ سـاقه‌ته‌ی دارمێـو 🇮🇷 ١. چوگان گوی بازی ٢. تنه‌ی تاک

**قاشول / qaşûl/:** ناو. قاشل؛ قالک؛ تێخول؛ تۆکڵ؛ توێکڵ؛ تۆخل؛ تێکوڵ 🇮🇷 پوسته

**قاشولکه / qaşûlke/:** ناو. قاشووله؛ ورتکه سوالـه‌ت و چـینی بـۆ کایـه‌ی منـالان 🇮🇷 چینـی و سُـفال شکسته، اسباب بازی کودکان

**قاشوله / qaşûle/:** ☜ **قاشولکه**

**قاشه / qaşe/:** ☜ **قاشنه**

**قاشه‌ئه‌نگوستیله / qaşe'engustîle/:** نـاو. نگـین؛ نقێم؛ به‌ردی ڕازاوه‌ی سه‌ر ئه‌نگوستیله 🇮🇷 نگین

**قاغز / qağiz/:** ☜ **کاغه‌ز**

**قاغنات / qağnat/:** ناو. قاخنات؛ قاخناک؛ قاقنات؛ قاغه‌نه‌ک؛ قاقنه‌ک؛ فرچک؛ فـرۆ؛ فرێشـک؛ ژه‌ک 🇮🇷 آغوز

**قاغه‌ز / qağez/:** ☜ **کاغه‌ز**

**قاغه‌نه‌ک / qağenek/:** ☜ **قاغنات**

**قـاف / qaf/:** نـاو. ١. مـه‌تال؛ مه‌تـه‌ڵ ٢. کـه‌لله؛ ئێسکی خڕی سه‌ر ٣. ده‌رفه‌ت؛ هـه‌ل؛ کـێس ٤. *[باوه‌ڕی کۆن]* چیایـه‌کی خه‌یالـی کـه په‌ڕانپـه‌ڕی زه‌وی داگرتووه و سیمر تێدا هێلانه‌ی کردووه ٥. کاری ده‌نگ‌دانی خه‌ڵک به تێکڕایی ٦. قێ؛ ناوی عه‌ره‌بی بیست‌ویه‌که‌مین پـیتی ئـه‌لفبای زمـانی کوردی ٧. جێ؛ جێگه؛ شوێن ‹قسه‌که‌ت له قافـی خۆیـدا بـوو› 🇮🇷 ١. چیسـتان؛ مُعمـا ٢. جُمجُمـه ٣. فُرصت ٤. کوه قاف ٥. بسیج عمومی ٦. حرف قاف ٧. جا؛ موقعیّت

**قـافقلۆر[1] / qafq(i)lor/:** نـاو. قـاپ و قاچـاغی لـه سوالـه‌ت 🇮🇷 ظروف سُفالین

**قـافقلۆر[2]:** ئاوه‌لـناو. *[کینایـه]* حـه‌پۆلی کـه‌مفـام 🇮🇷 تُهی‌مغز

**قافک / qafik/:** نـاو. ١. ئه‌شـکه‌ولـه‌ت؛ سوالـه‌ته شـکاو ٢. سوالـه‌تی لـه قالـب‌دراو بـۆ سـه‌ربان داپۆشین ٣. قاپلۆخ؛ قاپۆڕی ڕه‌قـه و کیسـه‌ڵ ٤. قاپ؛ کالان؛ به‌رگی شیر و خه‌نجـه‌ر 🇮🇷 ١. سُـفال شکسته ٢. سُفال بام ٣. لاک لاکپشت و مانند آن ٤. نیام

**قافل‌قه‌دا / qafilqeda/:** ناو. قه‌زا و قه‌ده‌ر 🇮🇷 قضا و قدر

**قـافلۆک / qaflok**/: نـاو. دەفـر و ئامـانی گڵـین؛ ئیرباری لە قوڕ ☰ ظرف سُفالین

**قافلی / qaflî**/: ☜ **قاخڵی**

**قافڵە / qafłe**/: ناو. قەفلە؛ کاروان؛ کەروان؛ شەقار؛ دەستەیەک مرۆ و بارەبەر کە ڕێبواری ڕێگایـەکن ‹قافلە کـۆچ کـەردەن بـەرزەن دەنـگ زەنـگ/ وران حوجرەی خان وجوود سەنگ بە سەنگ «مەولەوی»› ☰ قافلە

**قافڵەچی / qafłeçî**/: ناو. قافڵەسـالار؛ سـەرکاروان ‹قافڵـەچی ئامـان دادەن دەخـیلم/ بنـەکـدار خـەم خەیلێ زەلیلم «مەولەوی»› ☰ سرکاروان؛ قافلەسالار

**قافڵەسالار / qafłesalar**/: ☜ **قافڵەچی**

**قافڵی / qafłî**/: ☜ **قاخڵی**

**قافۆ / qafo**/: ☜ **قافوو**

**قـافـوو / qafû**/: نـاو. قـافۆ؛ قافـوو؛ ئاومالـک ☰ سیل‌آورده

**قافیە / qaf(i)ye**/: ☜ **سەروا**

**قـاڤ / qav**/: نـاو. پووشـووی دار کـە ببێتـە دەستەچیلە ☰ پوستەی پوسیدەی درخت کە افروزنە شود

**قاڤوو / qavû**/: ناو. ١. ☜ **قالۆرە** ٢. ☜ **قافوو**

**قاڤەڕەش / qaveřeş**/: ☜ **قاقڕەش**

**قاق / qaq**/: ئاوەڵناو. زوها؛ وشک؛ زڕ ☰ خُشک

**قاقا**[1] **/ qaqa**/: ناو. ١. تریقە؛ حیلکـەی پێکـەنین ‹ئەمجا لە پشت مۆسـیقاوە/ بـە دەم تریقـەی قاقـاوە «گۆران»› ٢. ☜ **قاقە ـ٢و٣** ☰ ١. قهقهه ٢. ☜ **قاقە ـ٢و٣**

**قاقانە / qaqane**/: ناو. بانجێڵە؛ بالکون ☰ بالکُن

**قاقانی / qaqanî**/: ناو. پارچەیەکی قـەدیمی بـوو ژنـان دەیـانکردە دەسمـاڵ ‹کلـۆنجە ڕێ ـ ڕێ، دەسماڵ قاقـانی/ بـەینی مـن و تـۆ عالـەم پـێ زانی «فولکلۆر»› ☰ یک نوع پارچەی قدیمی

**قاقبە / qaqbe**/: دەنگەناو. دەنگی خوێنـدنی کـەو ☰ صدای خواندن کبک

**قـاقبین / qaqbîn**/: چـاوگ. خوێنـدنی کـەو ☰ خواندن کبک

**قـاقڕ / qaqiř**/: ئاوەڵناو. ١. قـراج؛ تایبەتمەنـدی زەوینـێ کـە گیـای لـێ نـاڕوێ ٢. *[کینایە]* ڕژد؛ چکووس ☰ ١. لم یزرع ٢. خسیس

**قـاقڕەش / qaqřeş**/: نـاو. قاقـەڕەش؛ جـۆرێ کوولەکە ☰ نوعی کدو

**قاقز / qaqiz**/: ☜ **کاغەز**

**قاقژ / qaqij**/: ☜ **قەلەڕەش**

**قـاقل / qaqil**/: نـاو. ١. تێکولـی هێلکـە ٢. بـنی گیایەکە دەیخـۆن ☰ ١. پوستەی تخـم پرنـدە ٢. ریشەای خوراکی

**قاقلۆک / qaqlok**/: ناو. کەللەسەر؛ قاف؛ قەحف ☰ جُمجُمە

**قاقلەجنۆکـە / qaqlec(i)noke**/: نـاو. قاپیلکـەی هێلکەشەیتان؛ شـەیتانۆکەی وشـک ☰ پوسـتەی حلزون

**قاقلەسوێنە / qaqles(i)wêne**/: ☜ **قاقلەسۆنە**

**قاقلەسـۆنە / qaqlesone**/: نـاو. قاقلەسـوێنە؛ قانگلەسوێنە؛ دۆشەکۆڵـەی سـەری حـەماڵان ☰ بالشتک سر حمال

**قاقڵە / qaqłe**/: ناو. کەمـەی لانـک ☰ کمانـەی گهوارە

**قاقڵی / qaqłî**/: ☜ **قاخڵی**

**قـاقم / qaqim**/: نـاو. خـەز؛ قـاقوم؛ ئـاس: ١. دەڵەکی سپی؛ جـۆرێ گیانـداری خـەزدارە لـە دەڵەک دەچێ و لە ناوچە شـاخاوییەکاندا دەژی، هاوینـان بەشـی ژووریـنی پێسـتی خورمـایی و بەشی خوارینی سپییە بەڵام لە زستاندا جگە لـە ئاخری کلکی کە ڕەشـە، بـاقی جەسـتەی سـپی دەبێتەوە ٢. پێستی ئەو گیاندارە، کە زۆر نەرمە و جلوبەرگی لێ دروست دەکەن ☰ ١و٢. قاقُم

**قاقمه / qaqme/**: ناو. داری هەر دوولا و داری پشتی تامان ☰ چوب‌های عمودی دیوار ترکه‌ای

**قاقنات / qaqnat/**: ☜ قاغنات

**قاقنەک / qaqnek/**: ☜ قاغنات

**قاقوم / qaqum/**: ☜ قاقم

**قاقوله / qaqûle/**: ناو. بەری گیایەکە بۆ دەرمان دەبێ ☰ قاقُله

**قاقه / qaqe/**: ناو. ١. قورقوراگه؛ قورقوراچکه ٢. قاقا؛ برا گەوره ٣. *[مندالانه]* قاقا؛ قەقە؛ خوراده‌مەنی شیرین ☰ ١. خِرخِره ٢. داداش ٣. نونو

**قاقەز / qaqez/**: ☜ کاغەز

**قاقەزپەرداخ / qaqezperdax/**: ناو. کاغەزساو؛ قاقەزسماته ☰ کاغذ سُنباده

**قاقەزسماته / qaqezs(i)mate/**: ☜ قاقەزپەرداخ

**قاقەزێن / qaqezên/**: ناو. کایه به پەڕی پاسوور ☰ بازی با ورق

**قاقەناز / qaqenaz/**: ناو.ئاو. کۆڵه؛ تەواو سووتاو ☰ کاملاً سوخته

**قاقی / qaqî/**: ناو.ئاو. قاقیله؛ لاوازی کورتەبالا ☰ لاغر کوتاه‌قد

**قاقیشک / qaqîşk/**: ☜ قەلەڕەش

**قاقیلۆک / qaqîlok/**: ناو. تەختەساف؛ کلافە دەزووی له سەر مقەبا هەڵکراو ☰ کلاف نخ روی مقوای پهن

**قاقیله / qaqîle/**: ☜ قاقی

**قاگەز / qagez/**: ☜ کاغەز

**قال / qal/**: ناو. ١. دەمەجاوێک بنێشت ٢. چەقەچەق؛ هەرا و هوریا ٣. قسەوباس؛ وتوویژ ٤. تێخول و پرزەی دار ٥. دەنگوباسی ناو خەڵک ☰ ١. مقدار سقزِ مصرفِ یک بار ٢. جنجال؛ هیاهو ٣. بحث؛ گفتگو ٤. پوسته و الیاف درخت ٥. شایعه

**قالاس / qalas/**: ناو. گۆزەڵه یان کوندەی پچووک بۆ ئاو ☰ کوزه یا مَشک کوچک آب

**قالان / qalan/**: ناو. قەرەن؛ قەلەن؛ قەلەند؛ شیربایی؛ شیروایی ☰ شیربها

**قالاو / qalaw/**: ☜ قالاو

**قالب / qalib/**: ☜ قالب‌١تا٤

**قالشت / qalişt/**: ناو. قال: ١. تێکولی دار ٢. تەڕاش؛ تەلاشەدار ☰ ١. پوستەی درخت ٢. تکەی شکسته از درخت

**قالک / qalik/**: ناو. ١. ☜ قاشول ٢. قوتووی چکۆله ٣. پووکه؛ قاپۆرەفیشەک ٤. ☜ قالب‌١تا٤ ٥. توێکڵ؛ تۆکڵ ☰ ١. ☜ قاشول ٢. قوطی کوچک ٣. پوکه ٤. ☜ قالب‌١تا٤ ٥. پوسته

**قالنگ / qaling/**: ناو. داری درێژی سەرخوار بۆ میوه چنین ☰ چوب بلندسرخمیده برای میوه‌چینی

**قالنی / qalnî/**: ناو. عەرەبانەی له دار ☰ ارابەی چوبی

**قالوچ / qaluç/**: ناو. جۆرێ داسی پچووک ☰ نوعی داس کوچک

**قالون / qalun/**: ناو. سەبیلەی کلک‌درێژ ☰ چُپُق دسته بلند

**قالو / qalo/**: ناو. بەرد یان خشتی له سەر ئاگر دانراو له باتی ساج بۆ نان پێژان ☰ خشت یا سنگ بر آتش به جای ساج

**قالۆچه / qaloçe/**: ☜ قالۆنچه

**قالۆر / qalor/**: ناو. ١. ☜ قالۆره ٢. ئێسکی لۆلاک؛ پێشەی لاق ☰ ١. ☜ قالۆره ٢. استخوان ساق

**قالۆره / qalore/**: ناو. قالۆر؛ قافۆ؛ ساقەتەگیای ناوەڕۆک خالی بەتایبەت وەک ساقەتەی گوڵەبەڕۆژه ☰ ساقەی گیاه کاوک

**قالۆز / qaloz/**: ناو. دارۆکەیەکه له تەڵه کەورێشکدا ☰ چوبکی در تلەی خرگوش

**قالۆنچه / qalonçe/**: ناو. قالۆچه؛ قۆلاچه؛ قولاچه؛

قۆلانچە؛ قولانچە؛ قۆلانجە؛ قۆلە؛ خازباز؛ خازیبار؛ کێز؛ کێزک؛ ناوی گشتی مێروانی باڵقاپ بە چوار باڵەوە کە دوانی سەروویان ڕەق بووە و دووی ناوەوە دەپارێزێ ☰ سوسک

**قالۆنچەعەجەمانە / qalonçe'ecemane/**: ناو. گووگلێنە؛ گووخلێنکە؛ کێزک؛ گازولک ☰ سرگین‌غلتان

**قالەژنانە / qalej(i)nane/**: ناوەڵناو. ژنانیلە؛ ژنەڕەنگە ☰ خالەزنک

**قالەک / qalek/**: ناو. تاویاوەی زێڕ و زیو ☰ طلا و نقرەی مُذاب

**قالەن / qalen/**: ناوەڵناو. قالند؛ ستوور؛ ئەستوور؛ قەبە؛ بەگرتک ☰ ستبر

**قالی / qalî/**: ☜ قاڵی ـ١

**قالیچە / qalîçe/**: ناو. قالیچە؛ مەحفویرک؛ مەحفیرک؛ قالی لە ئەندازەی بچووکتر لە دوولەسێ (میتر) ☰ قالیچە

**قاڵ١ / qał/**: ناو. ١. چەقەچەق؛ هەرا و هوریا ٢. خاشاڵ؛ پڕوپووش ٣. باس؛ قسە و باس ☰ ١. جنجال ٢. خاشاک ٣. بحث

▣ **قاڵ بوونەوە**: خاڵی بوونەوەی زگ دوای تێر خواردن ‹ئەو هەموو نانەم خوارد، کەچی ئێستا قاڵ بوومەوە› ☰ گرسنه شدن بعد از سیری

**قاڵ داخستن**: ☜ قاو داخستن

**قاڵ داکەفتن**: دەنگۆ بڵاو بوون ‹قاڵ داکەفت کوڕەکەی لە هەندەران ژنی خواستوە› ☰ شایع شدن

**قاڵ دان**: /کینایە/ ناو زڕاندن ☰ اسرار کسی را فاش کردن

**قاڵ کردن**: هەرا و چەقەچەق کردن ‹دا قاڵ مەکەن! بزانین چی ئێژێ› ☰ سر و صدا و جنجال کردن

**قاڵ لێ کردن**: /کینایە/ ئاورووی کەسێ بردن ‹کوڕەکە وا مەکە! قاڵمان لێ ئەکەن› ☰ آبرو برای کسی نگذاشتن

**قاڵی شتێک بڕانەوە**: ١. کار یان باسی شتێک تەواو بوون ٢. /کینایە/ تەواو بوونی شتێک ✻ **قاڵی شتێک بڕینەوە** ☰ ١. سخن از موضوعی تمام شدن ٢. تمام شدن چیزی

**قاڵی کەسێک بڕانەوە/ بڕیانەوە**: /کینایە/ مردنی کەسێک ‹ئەوە من مردم قاڵم بڕیاوە/گەڵای جوانییەکەم لە دار کنیاوە «فولکلۆر»› ☰ مُردن کسی

**قاڵ٢**: ناوەڵناو. ١. تاواوە؛ تواوە؛ تاویاگەوە ‹سەرچاوەی سارد و زوڵاڵ/ هەڵقولی وەک زیوی قاڵ «هێمن»› ٢. ڕاهاتوو لە کار؛ لە کار دەرهاتوو ٣. تەجرەبە دیتوو لە ژیاندا ☰ ١. گُداخته ٢. کارآمد ٣. مُجرب

▣ **قاڵ بوون**: ١. توانەوە لە سەر ئاگر ٢. /کینایە/ ڕاهاتن و کارامە بوون ٣. /کینایە/ ئەزموون دیتن لە ژیاندا ☰ ١. ذوب شدن بر آتش ٢. کامل و کارآمد شدن ٣. مُجرب شدن در زندگی

**قاڵ٣**: دەنگ. وس؛ سس؛ فەرمان بە بێدەنگ بوون ‹قاڵ منالەکان! سەرم ئێشێ› ☰ هیس

**ـ قاڵ٤**: پاشوشە. جەنجاڵ ‹سەرقاڵ› ☰ ـ گرم

**قاڵابن / qałabin/**: ناو. ڕەبەنگ؛ ڕێواسی کولەبنە ☰ ریواس کوتاەقد و برگ پهن

**قاڵاخ / qałax/**: ناو. ١. ☜ قاڵاغ ٢. ☜ قەلەڕەش

**قاڵاخدان / qałaxdan/**: ☜ قاڵاغدان

**قاڵاخی / qałaxî/**: ناو. قەڵاخی؛ مادام؛ پارچەیەکی ڕەشە ☰ نوعی پارچەی مشکی

**قاڵاخی‌پۆش / qałaxîpoş/**: ناو. /کینایە/ قەڵاخی‌پۆش؛ ڕەشپۆش؛ تازیەدار؛ ئازیەتبار ☰ سیاەپوش؛ عزادار

**قاڵاغ / qałağ/**: ناو. قاڵاخ؛ قەڵاخ؛ تەپاڵە؛ دەوەی

وشکەوەبوو 🇮🇷 تاپالە

**قالاغدان / qałağdan/:** ناو. قالاخدان؛ قەلاخدان؛ دەوەلان 🇮🇷 انبار تاپالە

**قالاقنگ / qałaqing/:** ناو. بنی ڕێواس؛ گیایەکی گەلاپان و سەوزە کە ڕێواسی تێدا سەوز دەبێ 🇮🇷 بیخ ریواس

**قالانگ / qałang/:** ناو. ١. کلاوبنە؛ لاسقی گەلا ڕێواس ٢. گیاپلاو؛ گیایەکە بۆنی پلاوی لێ دێ 🇮🇷 ١. ساقەی برگ ریواس ٢. گیاهی است

**قالاو / qaław/:** ناو. قەل؛ قالاو؛ قراک؛ قرک؛ قلاق؛ قلا؛ قەلاو؛ قلاچە؛ قلاژیلە؛ قەلاسیلکە؛ قەلاسێلکە؛ قر؛ قژاک؛ قیژک؛ قژیاک؛ قوویاک؛ قارقارۆک؛ قارپچۆک؛ قراڕک؛ چیق؛ کژیک؛ قەرپلاش؛ قاژوو؛ تیرەیەک باڵندەی ڕەش، ڕەش و سپی یان بۆرە بە باڵ و پێ و دەندووکی ئەستوور و بەقەوەتەوە کە هەموو شت خۆر و بەکۆمەڵژییە و مێ و نێریشیان وەک یەکە 🇮🇷 کلاغ

**قالاوبازەڵە / qaławbazełe/:** ☜ قشقەرە ـ١

**قالاوخۆر / qaławxor/:** ناو. گوڵالە مووساییانە؛ جۆرێکە لە جۆرەکانی گیای قالاوگیر 🇮🇷 نوعی سُنبُلک

**قالاوفڕ / qaławfiř/:** ☜ قەلفڕ

**قالاوگیر / qaławgîr/:** ناو. سامرێژ؛ سەمرێژ؛ خێزانە گیایەکی ئالفییە، ڕیشەی بە سەلکەوەیە، هێشووەگوڵی شین و بنەوش دەکا 🇮🇷 کلاغک؛ سُنبُلک

**قالاوەبوولینە / qaławebûlîne/:** ☜ قشقەرە ـ١

**قالاوەڕەشە / qaławeřeşe/:** ☜ قەلەڕەش

**قالایی / qałayî/:** ☜ قەلایی

**قاڵب / qałib/:** ناو. ١. قالب؛ قالک؛ شتێ کە کانزای تاویاوی تێدەرێژن ٢. قالب؛ قالک؛ جەستە؛ لەش؛ بەدەن ‹قالبم بێ ڕۆح ئەروام نەمەندەن/ مەن دان حەیات زیندەگیم کەندەن «مەولەوی»› ٣. قالب؛ قالک؛ ژمارە بۆ دارژاوی توندەوەبوو ‹سێ قالب سابوون› ٤. قالب؛ قالک؛ قوتوو؛ دەفر بۆ شت تێدا فرۆشتن ٥. زەوینێ کە بۆ چەڵتووک چاندن تەخت کراوە ٦. قالب؛ قالک؛ ئامرازی خشت پێژان 🇮🇷 ١. قالب ریختەگری ٢. تن؛ بدن ٣. واحد شمارش اشیاء در قالب ریختە شدە ۴. قوطی؛ جعبەی بستەبندی ۵. زمین آمادە برای شالی ۶. قالب خشت‌زنی

▣ **قاڵبی کەسێ بوون:** ئەندازەی کەسێ بوون ‹ئەم کراسە تەواو قالبی خۆتە، بیسێنە!› 🇮🇷 اندازەی کسی بودن

**قاڵبدار / qałibdar/:** ناو. خشتبڕ؛ خشتپێژ 🇮🇷 خشت‌زن

**قاڵپاخ / qałpax/:** ناو. قاپاخ؛ قالپاق؛ کاسەیەکی کانزایی یان پەلاستیکی کە بە ناوڕاستی تەگەرەی ماشینەوە دەبەسرێ 🇮🇷 قالپاق

**قاڵپاق / qałpaq/:** ☜ قاڵپاخ

**قاڵتاخ / qałtax/:** ناو. قالتاغ: ١. قەلپاخ؛ داری نێو زین ٢. *[کنایە]* پیری زورهان 🇮🇷 ١. قلتاق؛ چوب داخل زین ٢. پیر فرتوت

**قاڵتاس / qałtas/:** ☜ قاڵتاق[1]

**قاڵتاغ / qałtağ/:** ☜ قاڵتاخ

**قاڵتاق[1] / qałtaq/:** ناو. قەلتاس؛ قالتاس؛ قەلچغ؛ قەلەسوو؛ داسوو؛ پرزەی گوڵە گەنم و ... 🇮🇷 اخگل

**قاڵتاق[2]:** ناوەڵناو. فێلباز؛ نادروس؛ تەڵەکەبازی درۆزن و چەورزمان 🇮🇷 قالتاق

**قاڵچغ / qałçiğ/:** ناو. قولچخ؛ قەلچغ؛ داسووکەی گوڵی وشکی خەلە 🇮🇷 پُرز خوشەی غلە

**قاڵچە / qałçe/:** ناو. دارێکی دوو لکە، دەیخەنە بەر ڕەشکە کا و شەغرە بۆ بارکردن 🇮🇷 چوبی دوشاخە برای بار کردن بار سنگین

**قالدرمه / qałdirme/:** ☜ **قادرمه**

**قالس / qałs/:** ئاوەڵناو. قەلس؛ قارس: ١. جاڕز ٢. تووڕە ▤ ١. پریشان ٢. خشمگین

**قالغان / qałğan/:** ناو. ١. کەرکۆل ٢. شانەی گولەبەڕۆژە ▤ ١. گیاهی خاردار ٢. خوشەی آفتابگردان

**قالک / qałik/:** ☜ **قاوخ**

**قالکراو / qałk(i)raw/:** ئاوەڵناو. هەڵچۆقیو؛ هەڵچۆقاو ▤ تفیده

**قالماسک / qałmasik/:** ☜ **قەڵماسك**

**قالماسکە / qałmaske/:** ☜ **قەڵماسك**

**قالمەقال / qałmeqałm/:** ناو. قالە؛ قالمەقالم؛ قالەقال؛ چەقەوهەرا ▤ جنجال و هیاهو

**قالمەقالم / qałmeqałm/:** ☜ **قالمەقال**

**قالند / qałind/:** ☜ **قالەن**

**قالە / qałe/:** ☜ **قالمەقال**

**قالەقال / qałeqał/:** ☜ **قالمەقال**

**قالەقنگ / qałeqing/:** ناو. کالاقنگ؛ قالاقنگ؛ باسکلاو؛ کلاوبن؛ گەلای ڕێواس ▤ بیخ ریواس

**قالی / qałî/:** ناو. ١. قالی؛ قالیە؛ خالی؛ مەهفوور؛ مافوور؛ ماهفوور؛ مافوورە؛ مافوویر؛ مافیر؛ مەحفیر؛ مەحفوویر؛ مەحفویر؛ مەهووز؛ بەستیر؛ گەوە؛ بکۆ؛ بسکۆ؛ تیژک؛ ڕایەخی بە تەون تەنراوی پرزەدار بۆ ڕاخستنی ناوماڵ ٢. کارامەیی؛ لێهاتوویی ▤ ١. قالی؛ فرش ٢. مهارت

⊡ **قالی چنین:** ☜ **قالی کردن**

**قالی کردن:** قالی چنین؛ تەون کردن؛ دروست کردنی قالی ▤ فرش بافتن

**قالیچن / qałîçin/:** ناو. قالیکەر؛ تەونکەر؛ جوومەکار؛ ئەوەی قالی دروست دەکا ▤ قالیباف

**قالیچە / qałîçe/:** ☜ **قالیچه**

**قالیفرۆشی / qałîf(i)roşî/:** ناو. ١. کاری فرۆشتنی قالی ٢. فرۆشگای قالی ▤ ١و٢. قالیفروشی

**قالیکەر / qałîker/:** ☜ **قالیچن**

**قالیە / qał(i)ye/:** ☜ **قالی ـ١**

**قام / qam/:** ناو. ١. گۆرانی؛ ستران؛ لاوژە ٢. ئالی؛ لا ٣. ئاکار؛ ڕێوڕەوش ٤. بەرزی بالا (مرۆ) ٥. هەل؛ دەرفەت ٦. کات؛ وەخت ٧. وزە؛ هێز و توانا ٨. هاوشێوەیی؛ وێکچوویی ▤ ١. ترانه؛ آهنگ ٢. طرف ٣. روش؛ منش ۴. بلندی قامت (آدمی) ۵. فُرصت ۶. هنگام ۷. توان ۸. شباهت

▣ **قام(ی) قیامەت:** هەستانی قیامەت؛ ڕۆژی پەسڵان ‹ڕاویار ماتەم، گرد دەروون تەنگەن/ قافڵەم تا قام قیامەت لەنگەن «مەولەوی»› ▤ قام قیامت

⊡ **قام کرن:** پێوان؛ ڕادەی درێژایی و پانایی و قوولایی ئەندازە گرتن ▤ طول و عرض و ارتفاع را سنجیدن

**قامبێژ / qambêj/:** ناو. گۆرانیبێژ ▤ ترانەخوان

**قامچ / qamç/:** ناو. دەرفەتی وە دەست کەوتن ▤ فرصت دسترسی

**قامچوشێ / qamçuşê/:** ناو. جۆرێ یاری منداڵانە ▤ از بازی‌های کودکانه

**قامچوور / qamçûr/:** ناو. سەرژمێری ماڵات بۆ مالیات ▤ سرشماری دام برای اخذ مالیات

**قامچوورچی / qamçûrçî/:** ناو. پووشانەوەرگر بۆ دەوڵەت ▤ مأمور مالیات

**قامچی / qamçî/:** ناو. ١. تازیانە؛ شەلاخ ٢. گۆرانیزان ▤ ١. تازیانه ٢. ترانه‌شناس

**قامخۆش / qamxoş/:** ئاوەڵناو. ١. پەردەژ؛ بە تایبەتمەندی سانا و ئاسان کەوتنە دەستەوە ٢. ڕەوشباش؛ ئاکارپەسند ▤ ١. سهل‌الوصول؛ آسان‌یاب ٢. بااخلاق

**قامر / qamir/:** ناو. ئەو نەیە زراقە کە دەکرێتە قەڵەم ▤ نی قلم خط

**قامک / qamk/**: ناو. ١. ئەنگوست؛ ئەنگۆس؛ تبل؛ تلی ٢. گەی تبل ٣. چەند داری بە پەنجەرە دە چەرخی گاریدا 🇮🇷 ١. انگشت ٢. بند انگشت ٣. پرەهای چرخ گاری

**قامکبەند / qamikbend/**: ناو. کلکبەس 🇮🇷 انگشتبند

**قامکپەڕیو / qamikpeřîw/**: ئاوەڵناو. کۆل؛ ئەنگووسقرتیاگ 🇮🇷 انگشتقطعشده

**قامکەتوتە / qamketûte/**: ناو. پووتە؛ قلینجک؛ تبلا بیچک؛ پچووکترین و ئاخرین قامک 🇮🇷 انگشت کوچک

**قامکەزلە / qamkezile/**: ☜ قامکەگەورە

**قامکەشادە / qamkeşade/**: ناو. دۆشاومژە؛ قامکی پەنای قامکەگەورە 🇮🇷 انگشت اشاره

**قامکەگەورە / qamkegewre/**: ناو. قامکەزلە؛ سپیَ کوژە؛ تبلا مەزن؛ یەکەمین و گەورەترین قامکی دەست و پیَ 🇮🇷 انگشت اشاره

**قامکەوانە / qamkewane/**: ناو. پۆشەنی قامک بۆ پاراستن لە کاردا (بەتایبەت دروینە) 🇮🇷 انگشتانه

**قاملەمە / qamleme/**: ☜ قابلەمە ـ١

**قاملەوە / qamlewe/**: ☜ قابلەمە ـ١

**قامنەخۆش / qamnexoş/**: ئاوەڵناو. ڕووگرژ؛ نەگونجاو 🇮🇷 بداخلاق

**قاموقلافەت / qam û q(i)łafet/**: ئاوەڵناو. بەژنزراوی جوانچاک 🇮🇷 زیبای باریکاندام

**قاموس / qamûs/**: ناو. فەرهەنگ؛ وشەدان 🇮🇷 لغتنامە؛ قاموس

**قاموش / qamûş/**: ☜ قامیش

**قامەت / qamet/**: ناو. ١. بالا؛ قەد ٢. فەرمانی دەسپیَکردنی نویَژ بە جەماعەت 🇮🇷 ١و٢. قامت

⊡ **قامەت بەستن**: ویستان بۆ نویَژی جەماعەت؛ دەسپیَکردنی نویَژ بە جەماعەت 🇮🇷 قامت بستن

**قامیش / qamîş/**: ناو. قامووش؛ چیتک؛ زەل 🇮🇷 نی

**قامیشبەند / qamîşbend/**: ناو. چیغی لە قامیش 🇮🇷 چیغ از نی

**قامیشەڵان / qamîşełan/**: ناو. قامیشەڵیَن؛ شویَنیَ کە زۆر قامیشی لیَ ڕواوە 🇮🇷 نیزار

**قامیشەڵیَن / qamîşełên/**: ☜ قامیشەڵان

**قامیشەهیَندی / qamîşehêndî/**: ناو. خەیزەران؛ ئارج 🇮🇷 خیزران

**قان[1] / qan/**: ناو. ١. قانگ؛ دەرفەت بۆ جاریَ تر یاری کردن بەوەی دۆڕاویە ‹بۆ ئەم جارەش قانم بدە!› ٢. خویَنبایی؛ خویَنبژی؛ سەربەها ٣. خاڵی دەم و چاو 🇮🇷 ١. مُهلت بازی بە بازندە ٢. خونبها ٣. خال صورت

⊡ **قان دان**: دەرفەت دان 🇮🇷 مُهلت دادن

**قان[2]**: ئاوەڵناو. قانگ؛ ناو پووک (توور و ...) 🇮🇷 پوکیدە (تُرُب و ...)

**قاناو / qanaw/**: ناو. دیَراوی باغ 🇮🇷 جوی آبیاری باغ

**قانتر / qantir/**: ☜ قاتر

**قانج / qanc/**: ☜ قەنج ـ١

**قانجاز / qancaz/**: ☜ قازانج

**قانچە / qançe/**: ناو. سوانە؛ پاسار 🇮🇷 لبەی بام

**قاندڕ / qandiř/**: ئاوەڵناو. ناحەقیکار؛ زاڵم 🇮🇷 ظالم

**قاندن / qandin/**: چاوگ. کۆڵین 🇮🇷 کندن

**قاندەلیک / qandelîk/**: ناو. دەفری ڕۆن و شتی بەردەستان لە مەدبەخ 🇮🇷 ظرف وردست در آشپزخانە

**قانزاج / qanzac/**: ☜ قازانج

**قانزان / qanzan/**: ☜ قازانج

**قانع / qani'/**: ئاوەڵناو. چاوتیَر؛ دڵتیَر 🇮🇷 قانع

**قانقاریا / qanqarya/**: ناو. ڕەشە؛ سەقاملووس؛ شەقاقلووس؛ مەرگی بەشیَک لە شانەگەلی لەش

بە هـۆی پـێنەگەیشـتنی خـوێن، کـوتران یـان چلک‌کردن 🇮🇷 قانقاریا

**قانک** / qan(i)k/: ☜ **قەڵماسك**

**قانـگ**[1] / qang/: نـاو. ١. دووکـەڵ؛ دوو ٢. ئەسپەندەر؛ ئەسپەند؛ دیدی ٣. قان؛ دەرفەت بـۆ دیسان یاری کردنی ئەوەی دۆڕاویـە 🇮🇷 ١. دود ٢. گیاه اسپند ٣. مُهلت به بازیگر بازنده

⊡ **قانـگ دان:** ١. بـە دووکـەڵ کوشـتن یـا دەرپەڕانـدنی بوونـەوەر و نـێچیر لـە کـون و کاژێران ٢. دەرفەتی تـر دان بـە یاریزانـێ کـە دۆڕاویە 🇮🇷 ١. با دود بیرون کردن ٢. مُهلت دوباره دادن به بازیکن بازنده

**خستنە قانگ:** ☜ **قانگ دان ـ١**

**قانگ**[2]: ئاوەڵناو. قـان؛ نـاو پـووک (تـوور و ...) 🇮🇷 پوکیده (تُرب و ...)

**قانگ**[3]: دەنگەناو. دەنگـی خۆنـدنی قازیقوڵـنگ 🇮🇷 صدای آواز درنا

**قانگلاش** / qang(i)laş/: ☜ **قانگەلاش**

**قانگڵ** / qangił/: ☜ **قانگڵەبەن**

**قانگڵە** / qang(i)łe/: نـاو. قانگەڵـە؛ کلافـە بـەنی بچووکی لە نێوان قامکی گەورە و تووتەدا هەڵکراو 🇮🇷 کلاف نخ جمع شـده میـان دو انگشـت شسـت و کوچک

⊡ **قانگڵە کردن:** بە شێوەی قانگڵە دەرهێنانی بەن 🇮🇷 کلاف کردن

**قانگڵەبەن** / qang(i)łeben/: نـاو. گـروف؛ گـروف؛ قانگڵ؛ قانگڵە؛ کلافەبـەنی بـەینی دوو قامـک 🇮🇷 کلاف نخ میان دو انگشت باز

**قانگڵەسـوێنە** / qang(i)łes(i)wêne/: ☜ **قاقلەسۆنە**

**قانگە** / qange/: ناو. ١. خەندەکی بناغەی خـانوو ٢. قالون؛ سەبیلەی کلک‌درێـژ 🇮🇷 ١. پـی خانـه ٢. چُپُق دسته بلند

**قانگـەلاش** / qangelaş/: نـاو. قـانگلاش؛ قانگەلاشک؛ قنگلاشک؛ قنگلاشک؛ قنگەلاشـک؛ قەڵقەلاشـک؛ قەنگەلاشـک؛ قەنگەلاشـک؛ بنـە کەنگری وشکی با بردە 🇮🇷 بتەی خشک و بادبردەی کنگر

**قانگەلاشک** / qangelaş(i)k/: ☜ **قانگەلاش**

**قانگەڵە** / qangełe/: ☜ **قانگڵە**

**قانـوون** / qanûn/: ناو. ١. ڕێزک؛ یاسا؛ یاسـە؛ داب و نـەریتێ کـە هـەموو کۆمەڵـگا بـەو پێیـە دەجووڵـێنەوە یـان ڕێوشـوێنێ کـە بـۆ کـار و کردەوەیەکی فەرمی دانراوە ٢. کـاری دەربـڕینی دووزەنە و پێوەندی نێوان چەند دیـاردە، کـە لـە ڕادەی زانینی ئێمەدا ناگۆڕدرێ ‹قانوونـی مانەوەی ماک و هێز› ٣. ئامرازێکی کـۆنی مووسـیقایی بـە ٢٦ تاڵ سیمەوە 🇮🇷 ١تا٣. قانون

⊡ **قانوون دانان:** نووسین و پەسند کردنی قـانوون 🇮🇷 قانون وضع کردن

**قانوونی** / qanûnî/: ئاوەڵـناو. یاسایی: ١. سـەر بـە قـانوون ‹برگـەی قـانوونی› ٢. ڕێکـی قـانوون ‹مامەڵەی قانوونی› 🇮🇷 ١و٢. قانونی

**قانە** / qane/: ناو. ١. ☜ **قانەمێو** ٢. توێ قوماش لە تۆپە قوماشدا ٣. گەزی پێـوانی قومـاش 🇮🇷 ١. ☜ **قانەمێو** ٢. لایەهای پارچە در توپ پارچە ٣. متر پارچەفروش

**قانەدیکە** / qanedîke/: ☜ **قدیلکە**

**قانەقدی** / qaneq(i)dî/: ☜ **قدیلکە**

**قانەقدیکە** / qaneq(i)dîke/: ☜ **قدیلکە**

**قانەقدیلکە** / qaneq(i)dîlke/: ☜ **قدیلکە**

**قانـەمێو** / qanemêw/: نـاو. قانـە؛ دێـراوەڕەز 🇮🇷 جوی تاکستان

**قانی** / qanî/: ناو. پەڵە؛ لەککە 🇮🇷 لکە

**قانیک** / qanîk/: ناو. بنێشت؛ جاچکـە 🇮🇷 آدامـس؛ سقز

**قاو / qaw/**: ناو. ١. قاڵ؛ پووشووی دار ‹سەبیلی با دا تەواو/ دەریهێنا ئەستێ و قاو «قـانع»› ٢. دەنگـی بەرز ‹قاو کردن› ٣. دەنگۆ؛ خەبـەرێ کـە دە نـاو حەشاماتدا بڵاو بۆتەوە ‹قاو داخسـتن› ٤. شـەپ؛ شەق ‹قاو دان› ٥. قاپ؛ دەفری شێو تێکـردن ٦. قۆنداخ؛ قۆناخ؛ پاژنەی تفەنگ ٧. هەنگاو؛ شـەقاو ■ ١. پده ٢. صدای بلند ٣. چو؛ شایعه ۴. تیپا ۵. ظرف غذاخوری ۶. قُنداق تفنگ ۷. گام

◻ **قاو داخستن:** قاڵ داخستن؛ دەنگۆ بڵاو کردنەوە ■ شایعه پراکندن

**قاو داکەوتن:** دەنگۆ بڵاو بوونەوە ■ شایعه افتادن

**قاو دان:** ١. دەرکردن بە هەراـ هـەرا ٢. شـەق تێ هەڵدان ■ ١. هَو کردن ٢. تیپا زدن

**قاو کردن:** ١. بانگ کـردن ٢. بـە هەراـ هـەرا وەدەرنان ■ ١. صدا زدن ٢. هو کردن

**قاوت / qawit/**: نـاو. قاویـت؛ کاویـت؛ پـۆخین؛ بـواردوو؛ ئـاردی دەخڵـی بـرژاو بـە شـەکر و بەهاراتەوە ■ قاووت

**قاوتاندن / qawtandin/**: چـاوگ. دەرکـردن بـە گوڕە و هەراوە ■ بیرون راندن با جار و جنجال

**قاوخ / qawix/**: ناو. قاوغ؛ قالک: ١. قـاون؛ قاقـل ٢. قاپۆر؛ قـابلۆخ؛ جـێ بـارووت لـە فیشـەک ٣. تۆکڵ؛ توێکڵە ■ ١. پوستەی تخم پرنده ٢. پوکه ٣. پوسته

**قاورمە / qawirme/**: نـاو. قەیلـە؛ قـەلی؛ قەڵـیە؛ قلیانی؛ گۆشـتی سـوورەوەکراوی وشـکەوبوو لـە هەمانەدا، بۆ تفاقی زستان ■ قُرمه

**قاورمەسـەوزی / qawirmesewzî/**: نـــاو. سـەوزیقاورمـە؛ خۆرشـتێکی لـە پلـە گۆشـت، سەوزی جنراو و لووبیا ■ قُرمەسبزی

**قاوڕ / qawiř/**: ناو. قاپۆر ■ پوکه

**قاوش / qawiş/**: ناو. شوێنی نووستنی بـەکۆمـەڵ ■ خوابگاه گروهی

**قاوشت / qawişt/**: ☜ **کاوێژ**

**قاوغ / qawiğ/**: نـاو. ١. ☜ **قـاوخ** ٢. کیسـەڵ؛ سیلە؛ کاسەپشت ■ ١. ☜ **قاوخ** ٢. لاکپشت

**قاوکوڵ / qawkuł/**: نـاو. جـۆرێ تفـەنگی پاژنـە کورت ■ نوعی تفنگ

**قاوکەر / qawker/**: ناو. گازیکەر؛ کەسێ کە بانـگ لە کەسێ دەکا ■ صدا کننده؛ ندا دهنده

**قاولەمە / qawleme/**: ناو. ١. ☜ **قابلەمـە ـ١** ٢. *[کنایه]* خۆراکێ کە لە دەشت دەیخۆن ■ ١. ☜ **قابلمه ـ١** ٢. غذای پیک‌نیک

**قاون / qawin/**: ناو. ١. ☜ **قاوخ ـ١** ٢. گنـدۆرە؛ کاڵەک؛ قارپوز ■ ١. ☜ **قاوخ ـ١** ٢. خربُزه

**قاووش / qawuş/**: ☜ **کاوێژ**

**قاووقریشک / qaw û q(i)rîşk/**: ☜ **قاووقیژ**

**قاووقوو / qaw û qû/**: ☜ **قاووقیژ**

**قاووقیژ / qaw û qîj/**: ناو. قاووقریشک؛ قـاووقوو؛ زەنا ـ زەنا ■ همهمه و جنجال

**قاووت / qawût/**: تۆشەی ڕێبوار؛ تیشەی سەفەر ■ توشەی راه

**قـاوە / qawe/**: نـاو. قـەهوە؛ قەڤـە: ١. دارێکـی هەمیشە سەوزە بە گەڵای هێلکەئاسا بەرانبەر بـە یەک و گوڵـی سـپی بۆنخـۆش و میـوەی خـڕ و سـفتەوە ٢. تـۆمی میـوەی ئـەو دارە کـە ئاڵـکالوئیدێک بـە نـاوی کـافیئینی تێدایـە و دنەدەری دەمارە، برژاوەکەی بە ڕەنگی قاوەییە و بۆنێکی تایبـەتی هەیـە، بـە شـێوەی جۆراوجـۆر دەخورێت ٣. خواردنەوەیەکی گەرم لە کوڵاندنی هاڕدراوی ئەو دەنکە ■ ١تا٣. قهوه

**قاوەبرێژ / qaweb(i)rêj/**: ناو. دەفـری قـاوە تێـدا برژاندن ■ ظرف قهوه بو دادن

**قاوەتو / qawetû/**: ☜ **قاوەتوون**

◻ **قاوەتو کردن:** ☜ **قاوەتوون کردن**

**قاوەتـوون / qawetûn/**: نـاو. قـاوەتی؛ قاوەڵـتی؛

قاوەڵتوون؛ قـاوەتوو: ١. تاشـت ٢. تاشـتی ⇐ ١. چاشت ٢. صُبحانه

▣ **قاوەتون کردن:** قاوەتوو/ قـاوەتی کـردن؛ نـانی بەیانی خواردن ⇐ صُبحانه خوردن

**قاوەتی / qawetî/:** ☜ **قاوەتون**

▣ **قاوەتی کردن:** ☜ **قاوەتون کردن**

**قاوەجاغ / qawecağ/:** ناو. تفک؛ کوانوو ⇐ اُجاق

**قـاوەجۆش / qaweco̧ş/:** نـاو. دەڵلە؛ دەفـری دەسەدار بۆ قاوە لێنان ⇐ قهوەجوش

**قـاوەچی / qaweçî/:** ناو. ١. کەسـێ کـە پیشـەی قاوە سـاز کردنـە ٢. چـایچی ⇐ ١. قهـوەچـی ٢. چایچی

**قاوەخانە / qawexane/:** ناو. ١. دووکـانی قـاوەی کولاو فروشتن ٢. چایخانە؛ چاخانە؛ شوێنێک بـۆ دانیشتن، قسەکردن و چای و قاوە خواردنـەوە (و خواردنی چێشتی سادە) ⇐ ١. قهوەخانه ٢. چایخانه

**قاوەدار / qawedar/:** ☜ **قاوەیی[٢]ـ٢**

**قاوەسینی / qawesînî/:** نـاو. سـینی پچـووک ⇐ سینی کوچک

**قاوەقاو / qaweqaw/:** ناو. زەنا ـ زەنا؛ هەرا و هوریا ⇐ سروصدا؛ همهمه

**قاوەلەمە / qaweleme/:** ☜ **قابلەمە ـ١**

**قاوەڵتون / qawełtûn/:** ☜ **قاوەتون**

**قـاوەڵتـوون[١] / qawełtûn/:** نـاو. ١. چاشـت؛ چاشتینگە؛ چێشتەنگاو؛ کاتی ناوەڕاستی بەیانی و نیوەڕۆ ٢. تاشتی؛ چاشتە؛ سەرتێشت؛ خـواردنی نێوان بەیانی و نیوەڕۆ ⇐ ١و٢. چاشت

**قاوەڵتوون[٢]:** ئاوەڵکار. چاشت؛ دەمی نێوان بـەیانی و نیوەڕۆ ‹من کە قاوەڵتوونێ هەڵدەسـتام لـە خـەو/ ئێستە نیمە ئیسـتیراحەت ڕۆژ و شـەو «هـێمن»› ⇐ چاشت

**قاوەڵتی / qawełtî/:** ☜ **قاوەتون**

**قـاوەیی[١] / qaweyî/:** نـاو. کەمکۆڵـی؛ بـۆر؛ بـوور؛ ڕەنگی نێوان زەرد و سوور ⇐ قهوەای

**قـاوەیی[٢]:** ئاوەڵـناو. ١. بـورجقین؛ کەمکۆڵـی؛ بـە ڕەنگی قاوە ٢. قاوەدار؛ تێکەڵ بە قـاوە ‹شـیرینی قاوەیی› ⇐ ١و٢. قهوەای

**قاویت / qawît/:** ☜ **قاوت**

**قـاویچ / qawîç/:** نـاو. قـاویش؛ کـاوێژ؛ کـاری جاوینەوەی پەڵخور ⇐ نشخوار

**قـاویش / qawîş/:** ناو. ١. ☜ **قـاویچ** ٢. چـەرمی دەباغدراوی ڕەنگکراو ⇐ ١. ☜ **قاویچ** ٢. چرم

**قاوێچ / qawêç/:** ☜ **کاوێژ**

**قاوێر / qawêr/:** ناو. کەمەی بێژنگ و هێڵـەک ⇐ چنبر غربال و الک

**قاوێش / qawêş/:** ☜ **کاوێژ**

**قاهیم / qahîm/:** ☜ **قایم**

**قای / qay/:** ئامراز. ئەی چۆن؛ کە وا بوو؛ کە وا بێ؛ وشەی دڵنیایی ⇐ که این طور

**قایخ / qayix/:** ☜ **قایەق**

**قایخەوان / qayxewan/:** ☜ **قایەقەوان**

**قایدە / qayde/:** ناو. ١. پۆن؛ پیسـار؛ سـەرخوێن؛ سووڕی مانگانەی ژنان ٢. ڕێسا؛ هەڵـس‌وکـەوتی شیاو ⇐ ١. قاعدگی زنان ٢. قاعده

**قایش / qayiş/:** ناو. ١. چەرمی ڕەنگکراوی بریقە لێدراو ٢. ئالقەچەرمێ کە هـەوجاڕ و نـیر لێـک دەبەسـتێ ٣. کێشـە و هـەرا؛ هـەرا و هـاوار ٤. قاریش؛ کەمەربەندی چەرمین ٥. سیرمە؛ زۆڵـە؛ شریتەی پان لە چەرم یان پلاسـتیک ٦. قایشـی دڵنیایی بۆ خۆ بەستنەوە لە ترۆمبیلدا ⇐ ١. قیش؛ چرم ورنی‌زده ٢. قیش؛ رابـط میـان خـیش و یـوغ ٣. دادوقال ۴. کمربند چرمی ۵. قایش ۶. کمربند ایمنی

**قایشکێش / qayişkêş/:** ☜ **قۆچەقانێ ـ١**

**قایغ / qayiğ/:** ☜ **قایەق**

**قایغەوان / qayiğewan/:** ☜ **قایەقەوان**

**قایق / qayiq/:** ☜ **قایەق**

**قایقەوان / qayqewan/:** ☜ **قایەقەوان**

**قایل / qayil/:** ئاوەڵناو. دڵنیا؛ ڕازی ☰ راضی

⊡ **قایل نەبوون:** ١. بە هیچ نەزانین ٢. گوێ پێ نەدان (زۆرتر بۆ ژن دەگوترێ لە حاند مێردەکەی) ☰ ١. قابل ندانستن ٢. تمکین نکردن

**قایل کردن:** قایل کرن: ١. پێ کردن؛ هێنانە ڕەدایە ٢. نەرم کردن بۆ شوو پێ کردن ☰ ١. مُلزم کردن ٢. موافق کردن (زن) برای ازدواج

**قایل کرن:** ☜ **قایل کردن**

**قایم / qayim/:** ئاوەڵناو. قاهیم: ١. توند؛ پتەو ٢. شاراوە؛ داشاریاگ ٣. قیت؛ ڕێک ڕاوەستاو ٤. ئەستوور؛ کولۆفت ☰ ١. مُحکم ٢. پنهان شده ٣. قائم ٤. کُلُفت؛ ضخیم

⊡ **قایم کردن:** ١. توند کردن؛ پتەو کردن ٢. بەستن؛ داخستن (بۆ دەرک و پەنجەرە و قفل) ٣. شاردنەوە ‹شاریان فرۆشت و دراوەکەیان نەخد و پوخت، لە تەنکەی گیرفان قایم کرد «هێمن»› ☰ ١. سفت و مُحکم کردن ٢. بستن در و قفل و... ٣. پنهان کردن

**قایمکار / qayimkar/:** ☜ **قایمەکار**

**قایمکاری / qayimkarî/:** ☜ **قایمەکاری**

**قایممەقام / qayimmeqam/:** ناو. جێگر؛ نایب ☰ قایم‌مقام

**قایمە / qayme/:** ناو. ١. داڵووتی ڕەز؛ داربەستی دارەمێو ٢. شتی شاراوە بۆ ڕۆژی تەنگانە ٣. ڕەوتی نەدۆڕان و نەبردنەوە لە یاری دامەدا ☰ ١. وادیج؛ داربست تاک ٢. نهفتە برای روز مبادا ٣. نتیجەی مساوی در بازی داما

**قایمەکار / qaymekar/:** ئاوەڵناو. قایمکار؛ بەمشوور ☰ مُدبر

**قایمەکاری / qaymekarî/:** ناو. قایمکاری؛ بەمشووری ☰ مُحکم‌کاری

**قایمەلان / qaymelan/:** ناو. لانێک؛ کونی کەروێشک کە دەست پێڕاگەیشتنی بۆ ڕاوچی دژوار بێ ☰ لانەی پنهانی خرگوش

**قایمەمێو / qaymemêw/:** ناو. سەرپەنە؛ کێتە؛ کەڵەژ؛ داربەستی داری ڕەز ڤ وادیج؛ چوب‌بست درخت مو

**قایمی / qay(i)mî/:** ناو. توندی؛ پتەوی ☰ استحکام

**قایوشت / qayuşt/:** ناو. کاوێژ؛ کاویچ؛ ژاء ژاو ☰ نشخوار

**قایە / qaye/:** ناو. پەنەگا؛ پەناگا؛ ئەنوا ☰ پناهگاه

**قایەخ / qayex/:** ☜ **قایەق**

**قایەق / qayeq/:** ناو. قایخ؛ قایغ؛ قایق؛ قایەخ؛ قەیک؛ بەلەم؛ لۆتکە ☰ قایق

**قایەقەوان / qayeqewan/:** ناو. قایخەوان؛ قایغەوان؛ قایقەوان؛ قەیاخەوان؛ لۆتکەوان؛ بەلەمئاژۆ؛ ئاژۆری بەلەم ☰ قایقران

**قبراخ / qibřax/:** ناو. ناوبژی؛ ئەوی دوو کەس لە سەر مەبەستێ پێکدێنێ ☰ میانجی

**قبڵاندن / qibłandin/:** ☜ **قەبووڵاندن**

**قبووڵ / q(i)bûł/:** ☜ **قەبووڵ**

**قبووڵی / q(i)bûłî/:** ناو. قوبڵی: ١. شێوی برنجی نەپاڵێوراو ٢. میوانی؛ بانگهێشتی خەڵک ☰ ١. کتە؛ دم‌پُختک ٢. مهمانی

**قپ / qip/:** پێرۆ. ← **قروقپ**

**قپنای / qipnay/:** ☜ **قوپنای**

**قپیای / qipyay/:** ☜ **قوپیای**

**قت[1] / qit/:** ناو. ١. فت؛ کاری دەراویشتن لە ڕیز ٢. قەت؛ قەرت؛ کەرت؛ کاری بڕان و نەمان ‹بەرق قت بوو، ئاویش قتە› ☰ ١. حذف ٢. قطع

⊡ **قت بوون:** فت بوون؛ لە ڕیز دەرچوون. هەروەها: **قت کردن؛ قت کران** ☰ حذف شدن

**قت[2]:** ئاوەڵناو. فت؛ لە ڕیزی بازی دەرکراو ‹فەلە زل بوون. جوو بوو بە شت. بەشی ئێمەش: هەر قت، هەر

فت، هەر گزوفت! «هەژار، *چوار ناميلکە*»؛ 🇮🇷 حذف شده از بازی

**قت**[۲]: ئاوەڵکار. کەمووسکە؛ پێچەک؛ هەندێکی زۆر کەم 🇮🇷 بسيار اندک

**قت**[۴]: سازرسته. وشەیەکە بۆ دەرکردنی یاریکارێ لە یاری دەگوترێ، بەتایبەت لە کایەی چاوشارەکێدا 🇮🇷 واژەی حذف از بازی

**قتاو** / q(i)taw/: ☜ **قوتاب**

**قتاوخان** / q(i)tawxan/: ☜ **قوتابخانه**

**قتاوخانه** / q(i)tawxane/: ☜ **قوتابخانه**

**قتاوی** / q(i)tawî/: ☜ **قوتابی**

**قتد** / q(i)tid/: ☜ **قژن**

**قتک** / qitk/: ناو. ۱. کوڕکوڕە؛ کوڕکوڕ؛ قەتێ ۲. جۆرێ خەیار 🇮🇷 ۱. باقرقره ۲. نوعی خيار

**قتلاب** / qitlab/: ناو. کەفۆت؛ کەوت؛ کەبۆت؛ دارێکی لێڕەواری سەختە 🇮🇷 نوعی چوب جنگلی مُحکم

**قتوفت** / qit û fit/: ناو. ۱. جرتوفرت؛ فرکوهۆڕ ۲. کاری دەراویتن بە یەکجاری 🇮🇷 ۱. ورجه ـ وورجه ۲. حذف

**قتو** / q(i)tû/: ئاوەڵناو. ئاژاوەچی؛ شۆفار 🇮🇷 فتنه‌انگيز

**قتوت** / q(i)tût/: ناو. داگیر؛ زەوت 🇮🇷 غصب

**قتی** / q(i)tî/: ناو. ترۆزی؛ چەمیلە 🇮🇷 خيار چنبر

**قجی** / q(i)cî/: ناو. ۱. پەڕپەڵەکە؛ چۆلەکەگرە ۲. ☜ **قجیلە ـ۱** 🇮🇷 ۱. سنگ چشم ۲. ☜ **قجیلە ـ۱**

**قجیبەڵەک** / q(i)cîbełek/: ناو. باڵبەڵەکە؛ پەڕپەڵەکە؛ سەقری مێشخۆر 🇮🇷 سنگ‌چشم

**قجیلک** / q(i)cîlik/: ناو. تووتە؛ قامکەتووتە 🇮🇷 انگشت کوچک

**قجیلە** / q(i)cîle/: ناو. ۱. قجی؛ پێمریشکە؛ گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ ۲. جۆرێ کولە 🇮🇷 ۱. گياهی دارويی ۲. نوعی ملخ

**قچ**[۱] / qiç/: ناو. ۱. دۆت؛ دویت؛ کچ؛ فرزەندی مێوینە ۲. ئەژنۆ؛ وژنگ ۳. قاچ؛ پووز و بەلەک 🇮🇷 ۱. دختر ۲. زانو ۳. ساق پا

**قچ**[۲]: ئاوەڵناو. ۱. ددان‌گڕ؛ تایبەتمەندی کەسێ کە لێوی کورتە و ددانی دیارە ۲. هەستۆک؛ لە سەرهەست 🇮🇷 ۱. لب کوتاه ۲. حسّاس

**قچان** / q(i)çan/: ☜ **قەومان**[۱]

**قچاندن** / qiçandin/: چاوگ. ۱. قەوماندن؛ قۆماندن؛ ئاژاوە و پشێوی نانەوە ۲. شتێکی نهێنی ئاشکرا کردن 🇮🇷 ۱. حادثه آفريدن ۲. برملا کردن

**قچقچاندن** / qiçqiçandin/: چاوگ. ۱. چۆقاندن/ قرچاندنی ڕۆن ۲. هەڵکزاندنی دووگ 🇮🇷 ۱. گداختن روغن ۲. سرخ کردن دُنبه

**قچک** / qiçik/: ئاوەڵناو. بچووک؛ چکولووکە؛ بیچکەلانە؛ بوچکەلە 🇮🇷 کوچولو

**قخ** / qix/: ☜ **قخه**

**قخخه** / qixxe/: ☜ **قخه**

**قخه** / qixe/: دەنگ. قخ؛ قخخه؛ وشەی ئاگاداری دان بە منداڵ، واتا پیس 🇮🇷 کلمه‌ی تحذير بچه به معنی کثيف

**قد** / qid/: ☜ **قرت**[۱]

**قدقدانک** / qidq(i)danik/: ☜ **قدیلکه**

**قدوم** / q(i)dum/: ناو. ۱. هێزی ئەژنۆ؛ قەوەتی ڕێگەچوون ‹ل ترسا قدومم لێ شکا› ۲. ☜ **قدومه** 🇮🇷 ۱. نای راه رفتن؛ قدرت حرکت ۲. ☜ **قدومه**

**قدومه** / q(i)dume/: ☜ **قدومه**

**قدۆش** / q(i)doş/: ئاوەڵناو. بەدودم؛ شووم؛ قەدەمشەڕ؛ قۆشە 🇮🇷 نحس؛ شوم

**قدۆشی** / q(i)doşî/: ناو. بەدودمی؛ شوومی 🇮🇷 شومی؛ نحسی

**قدومە** / q(i)dûme/: ناو. قدوم؛ قدومە؛ ڕوەکێکە

لە تیرەی «شەوبۆ» لە نزیک ڕێگا و باندا دەڕوێ و لە هەندێک شوێن تا ٩٠ سانتیمیتر باڵا دەکا، گوڵی بچووکی زەرد دەگرێ، تووەکەی بۆ دەرمانی کۆخە دەشێ ⇐ خاکشیر طبی

**قدیک / q(i)dîk/**: ئاوەڵناو. دڵتەنگ؛ خەمبار ⇐ دلتنگ

**قدیکە / q(i)dîke/**: ☜ **قدیلکە**

**قدیلکانێ / q(i)dîlkanê/**: ☜ **قدیلکە**

**قدیلکە / q(i)dîlke/**: ناو. قانەقدی؛ قانەدیکە؛ قانەقدیلکە؛ قانەقدیکە؛ قدقدانک؛ قدیکە؛ قدیلکانێ؛ قدیلە؛ قلی؛ ختیلکە؛ ختکێ؛ ختخت؛ دنەیەک بۆ وە پێکەنین هێنان بە هۆی بزواندنی ماسوولکەیەکی نەرمی لەش بە قامک یان شتیتر ⇐ قلقلک

**قدیلە / q(i)dîle/**: ☜ **قدیلکە**

**قراج / q(i)rac/**: ☜ **قاقڕ_١**

**قراخ / q(i)rax/**: ☜ **قەراغ**

**قرازنای / q(i)raznay/**: چاوگ. قرازیایۆ؛ قاڕاندنی مەل بە چەشنێکی تایبەت ⇐ خواندن پرندە بە نوعی مخصوص

**قرازیایۆ / q(i)razyayo/**: ☜ **قرازنای**

**قراڤە / q(i)rave/**: ناو. خووسار؛ خوویز؛ زوقم ⇐ یَژ؛ سرماریزە

**قراک / q(i)rak/**: ☜ **قەلەڕەش**

**قراکەسەوزە / q(i)rakesewze/**: ناو. کاسەڵەشینە؛ کاسەڵەشینکە ⇐ سبزقبا

**قرام / q(i)ram/**: ناو. گیایەکە پرزەی دهۆننەوە ⇐ گیاهی الیافی

**قران / q(i)ran/**: ☜ **قران**[٢]

**قربۆق / qirboq/**: ☜ **قرپۆق**

**قربیجە / qirbîce/**: ناو. گیایەکی دەشتییە ⇐ گیاهی صحرایی

**قرپ**[١] **/ qirp/**: ناو. ١. ☜ **قرقێنە** ٢. تالان؛ چەپاو؛ زاخۆران ٣. ڕەوتی لە ناو چوون؛ فەوتان ٤. کاری بڕین بە یەک جار تەور لێدان ٥. کار و ڕەوتی پەرتاوتن؛ هەڵپەرتاوتن ٦. دەسکەنە؛ کاری ڕنینەوە بە دەست ٧. بڕە دارێک؛ باوەشێک هێزم ٨. کاری پڕ پێدا کردن ⇐ ١. ☜ **قرقێنە** ٢. تاراج ٣. فرایند از بین رفتن ۴. عمل قطع کردن با یک ضربەی تبر ۵. هرس ۶. درو با دست ۷. دستەای هیزم ۸ عمل قاپیدن

**قرپ**[٢]: دەنگ. دەنگی شکان و قرتانی شتی سفت ⇐ صدای قطع شدن چیز سخت

**قرپاسان / qirpasan/**: ناو. زەوینی بە پیت و پڕ گژ و گیا ⇐ مزرعەی خوب و حاصلخیز

**قرپاڵ / qirpał/**: ناو. قەرپاڵ؛ جلکی ڕزیوی هەڵاهەڵابووی خێر پێوەنەماو ⇐ لباس پارە

**قرپان / qirpan/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //قرپای؛ دەقرپێی؛ بقرپێ// هەڵپاچران ⇐ هرس شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: قرپاو/ چاوگی نەرێنی: نەقرپان

**قرپاندن / qirpandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //قرپاندت؛ دەقرپێنی؛ بقرپێنە// ١. پەرتاوتن؛ داپاچین ٢. پڕ پێدا کردن ⇐ ١. هرس کردن ٢. قاپیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەقرپاندن

**قرپک**[١] **/ qirpik/**: ☜ **قرپۆق**

**قرپک**[٢]: ☜ **قرپۆک**[٢]

**قرپن / qirpin/**: ئاوەڵناو. *[پلار]* قرپۆ؛ تایبەتمەندی کەسێ کە زۆر قرقێنە دەدا ⇐ ویژگی کسی کە زیاد آروغ میزند

**قرپنە / qirp(i)ne/**: ئاوەڵناو. خرپن؛ چکۆڵەی خڕەکەڵە ⇐ تُپُل؛ کوچولوی چاقالو

**قرپۆ / qirpo/**: ئاوەڵناو. *[پلار]* ١. خوێڕی و بێکارە ٢. ☜ **قرپن** ⇐ ١. ولگرد بیکارە ٢. ☜ **قرپن**

**قرپۆک**[١] **/ qirpok/**: ☜ **قرپۆق**

**قرپۆک**[٢]: ئاوەڵناو. *[پلار]* قرپک؛ قرپۆک: ١. قرپۆ؛

خوێڕی و بێکاره ٢. قرپۆڵ؛ وشکههڵاتوو (مێوژ) ٣. قرپۆڵ؛ بێنرخ؛ ئەیاخ ☰ ١. ولگرد بیکاره ٢. خشکیده (مویز) ٣. بُنجُل

**قرپۆڵ** / qirpoł/: ☜ **قرپۆک-٢و٣**

**قرپە**[1] / qirpe/: ☜ **قرقێته**

**قرپە**[2]: دەنگەناو. قەرپ؛ دەنگی شکانی ئێزنگ ☰ صدای شکستن هیزُم

⊡ **قرپە کردن**: قرپین؛ قرپە لێ هاتن؛ دەنگی شکان لێ هاتن ‹پشتم قرپەیەکی کرد و هەناسەم هەڵگەڕاوە› ☰ صدای شکستن درآمدن

**قرپە لێهاتن**: ☜ **قرپە کردن**

**قرپین** / qirpîn/: چاوگ. دەرهاتنی دەنگی شکانی ئێزنگ ☰ درآمدن صدای شکستن هیزم

**قرت**[1] / qirt/: ناو. لەت؛ پاژ؛ قد؛ بەشێکی گچکە لە شتێک ☰ تکه؛ جزء

⊡ **قرت کردن**: ١. خشت کردن؛ ڕێک بڕین ‹پەرچووکەی بە قەیچی قرت کرد› ٢. دەرکردن لە کایە ☰ ١. صاف و راست بریدن ٢. اخراج کردن از بازی

**قرت لێ بڕین**: ☜ **قرتە لێ بڕین**

**قرت**[2]: ناوەڵناو. *[پلار]* جلف؛ سووک و چرووک ☰ هرزه؛ قرتی

**قرت**[3]: دەنگەناو. ١. قد؛ دەنگی مریشک ٢. دەنگی بە ددان لەت کردن ☰ ١. قُد؛ صدای مُرغ ٢. صدای خاییدن

**قرتاڵ** / qirtał/: ناو. قرتاله؛ قولینه؛ تریان ☰ سبد میوەچینی

**قرتاڵه** / qirtałe/: ☜ **قرتاڵ**

**قرتان** / qirtan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //قرتای؛ دەقرتێی؛ بقرتێ// قرتیان؛ قرتین: ١. پسان (بە ددان، تۆرتۆ یان ...) ٢. ترووکان؛ شکان بە ددان (تۆم و ...) ٣. *[مەجاز]* بڕان؛ هیلاک بوون ‹ئیتر قرتام ناتوانم کار بکەم› ☰ ١. گُسستن؛ قطع شدن (با دندان، قیچی یا ...) ٢. شکسته شدن با دندان (تخمه و ...) ٣. بُریدن؛ به شدت خسته شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: قرتاو/ چاوگی نەرێنی: نەقرتان

**قرتاندن** / qirtandin/: چاوگ. تێپەڕ. //قرتاندت؛ دەقرتێنی؛ بقرتێنە// قرتانن؛ قەتاندن: ١. پساندن؛ لەت کردن و لێک جیا کردنەوە ‹بەنەکەم قرتاند› ٢. ترووکاندن؛ تووکانن ‹هەموو تۆمەکەی قرتاند› ٣. *[مەجاز]* چیدی درێژە نەدان ‹قسەکانی قرتاند› ☰ ١. قطع کردن ٢. شکستن تخمه با دندان ٣. ادامه ندادن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ــ/ چاوگی نەرێنی: نەقرتاندن

**قرتانن** / qirtanin/: ☜ **قرتاندن**

**قرتاو** / qirtaw/: ئاوەڵناو. قرتیاگ؛ پچڕاو؛ پساو ☰ گسسته؛ قطع‌شده

**قرتقرتۆک** / qirtqirtok/: ناو. قرتقرتۆکه؛ قوڕگ ☰ حلق

**قرتقرتۆکه** / qirtqirtoke/: ☜ **قرتقرتۆک**

**قرتک** / qirtik/: ناو. ١. چۆنیەتی دڵ تێکەڵ هاتن ٢. بۆنی ناخۆشی گران ٣. ☜ **قرتکه** ☰ ١. حالت تهوع ٢. بوی تند زننده ٣. ☜ **قرتکه**

**قرتکه** / qirtke/: ناو. قرتک؛ قرت و پاژی بچووک. هەروەها: **قرتکه ـ قرتکه** ☰ جُزء

⊡ **قرتکه لێ بڕین**: ☜ **قرتە لێ بڕین**

**قرتم** / qirtim/: ناو. ١. قۆرتم؛ قورتم؛ خورتووم؛ ئەندامێکی درێژی شتهەڵگر، گۆشتن و نەرم، کە لە لووت و لەوسی سەرووی هێندێک لە گوهانداران (وەک فیل) پێکهاتووە ٢. مەڵەغان؛ ماڵەغان؛ کەرەمتوو؛ داسی درێژ ☰ ١. خرطوم ٢. داس بلند

**قرتماخه** / qirtmaxe/: ☜ **قەتماخه**

**قرتماغه** / qirtmağe/: ☜ **قەتماخه**

**قرتمدار** / qirtimdar/: ئاوەڵناو. خاوەن ئەندامی

دریژی شت‌هەڵگر ≡ خرطومدار

**قرتن / qirtin/**: ئاوەڵناو. [کینایە] ڕژد؛ چرووک؛ چنۆک؛ چکووس؛ ڕەزیل ≡ خسیس

**قرتنای / qirtnay/**: چاوگ. قرتاندن ≡ قطع کردن

**قرتە[1] / qirte/**: ناو. ١. ☜ **قرتێنە** ـ١ ٢. پچووکترین پاژ ≡ ١. ☜ **قرتێنە** ـ١ ٢. کوچکترین جُزء

⊡ **قرتە کردن**: [مەجاز] لە شتێ خواردن؛ دەنووک لێدان ≡ خوردن

**قرتە لێ برین**: [مەجاز] قرت/ قرتکە لێ بڕین؛ پاکەو کردن؛ هیچ نەهێشتنەوە ‹بێ تۆ ناخۆش، یەک مریشکی سوورەوە کراوی بە نانەوە دامێ، قرتەم لێ بڕی! «هەژار، چێشتی مجێور»› ≡ هیچ باقی نگذاشتن

**قرتە[2]**: دەنگەناو. ١. وسە؛ سرتە؛ کەمترین دەنگ ‹بێدەنگ بووم، قرتەم نەهات! «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. قرتەقرت؛ دەنگی مریشکی کورک ≡ ١. جیک؛ کمترین صدا ٢. صدای مرغ کُرچ

**قرتەقرت[1] / qirteqirt/**: ئاوەڵناو. لەت ـ لەت؛ تیکە ـ تیکە ≡ تکە ـ تکە

**قرتەقرت[2]**: ☜ **قرتە[2]** ـ٢

**قرتی / qirtî/**: ئاوەڵناو. [یلار] قرت؛ جلف؛ سووک ≡ هرزە؛ قرتی

**قرتیاگ / qirt(i)yag/**: ☜ **قرتاو**

**قرتیان / qirt(i)yan/**: ☜ **قرتان**

**قرتیای / qirt(i)yay/**: چاوگ. قرتان ≡ قطع شدن

**قرتیل / qirtîl/**: ناو. پاشاخور؛ کای درشتی بەرماوی حەیوان ≡ کاه درشت پسماندەی حیوان

**قرتین / qirtîn/**: ☜ **قرتان**

**ـ قرتێن / qirtên-/**: پاشەوشە. قرتێنەر ‹بەن‌قرتێن› ≡ ـ بُر

**قرتێنکە / qirtênke/**: ناو. ١. ☜ **قرتێنە** ـ١ ٢. جێگەی بڕین لە ملی پەلەوەردا ≡ ١. ☜ **قرتێنە** ـ١ ٢. جای بُریدن گلوی پرنده

**قرتێنە / qirtêne/**: ناو. ١. قرتە؛ قرتێنکە؛ تەقە؛ نێرە و مێوە لە باتی دوگمە ٢. چێوێ کە نووکی قەڵەمخەتی لە سەر دەقرتێنن ≡ ١. منگنە ٢. چوب قطعەزدن قلم نی

**قرتێنەر / qirtêner/**: ☜ **قرتێن**

**قرجەنە / qircene/**: ناو. شەم؛ مۆم؛ شەماڵک ≡ شمع

**قرچ[1] / qirç/**: ناو. ١. ڕەوتی توانەوەی ڕۆن لە سەر ئاگر ٢. [کینایە] قرچە؛ گەرمای زۆر ≡ ١. حالت ذوب شدن روغن بر آتش ٢. گرمای شدید

**قرچ[2]**: ئاوەڵناو. چرچ و ترنجاو لە سووتانەوە ≡ چروک شدە از سوختگی

⊡ **قرچ هەڵاتن**: چرچ و لۆچ بوونی پێست لە سووتانەوە ≡ چین و چروک شدن پوست از سوختگی

**قرچ[3]**: دەنگەناو. ١. دەنگی کوڵانی ڕۆن لە سەر ئاگر ٢. دەنگی سووتانی چیلکە و ئێزنگ ≡ ١. صدای روغن داغ ٢. صدای سوختن هیزُم

**قرچ[4]**: دەنگ. وشەیەکە لە بازی کەلایێندا ≡ اصطلاحی در تیلەبازی

**قرچاڵە / qirçałe/**: ئاوەڵناو. ترسنۆک؛ ترسەنۆک ≡ ترسو

**قرچان / qirçan/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //قرچای؛ دەقرچێی؛ بقرچێ// قرچیان؛ داخ بوونی ڕۆن لە سەر ئاگر ‹شەو و ڕۆژێ دەبرژێم و دەقرچێم/ بە سووتن ئیکتیفا ناکەم وەکوو موو «حاجی قادر»› ≡ گداختن روغن بر آتش

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: قرچاو/ چاوگی نەرێنی: نەقرچان

**قرچاندن / qirçandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //قرچاندت؛ دەقرچێنی؛ بقرچێنە// قرچانن؛ قرژاندن: ١. قیژلاندن؛ داخ کردنی ڕۆن لە سەر ئاگر ٢. چرچ

و لۆچ کردن ☰ ١. داغ کردن روغن ٢. چروک کردن
■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەقرچاندن

**قرچاندنـــەوە** / qirçand(i)newe/: چـــاوگ. قرچاننەوە؛ برژاندنەوە؛ دەرمان کـردن بـۆ خـوێن وەستان ☰ خون بست کردن زخم با دارو

**قرچانن** / qirçanin/: ☜ **قرچاندن**

**قرچاننەوە** / qirçannewe/: ☜ **قرچاندنەوە**

**قرچانەوە** / qirçanewe/: چاوگ. برژاندنـەوە؛ ژان کردنی جێ برین ☰ سوزش داشتن

**قرچـاو** / qirçaw/: ئاوەڵـناو. ١. داغ کـــراو ‹ڕۆنی قرچاو› ٢. چرچ هەڵـگەڕاو لـە سـووتان ‹کراسی قرچاو› ☰ ١. گُداختە ٢. چین و چروک برداشتە از سوختگی

**قرچاوی** / qirçawî/: ناو. نەژد؛ قرچی؛ چرچـی ☰ چروکیدگی

**قرچک** / qirçik/: نـاو. قۆڵـەکراس؛ ئانگوچـک ☰ آستین

**قرچنـایۆ** / qirçnayo/: چـاوگ. قرچاندنـــەوە ☰ دوبارە داغ کردن با روغن

**قرچوهۆڕ** / qirç û hoř/: دەنگەناو. دەنگی سووتانی چەوری لە سەر ئاگر ☰ جلزوولز

**قرچۆک** / qirçok/: ئاوەڵـناو. ١. *[بەلار]* ڕژد؛ ڕەزیـل ٢. پسۆک؛ تایبەتەمەندیی داوێ کە زوو دەپسـێ ٣. ☜ **قرچـەك** ☰ ١. خسـیس ٢. سُسـت ٣. ☜ **قرچەك**

**قرچۆڵ** / qirçoł/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **قرچۆڵە** ٢. ☜ **قرچەڵۆك**

**قرچۆڵە** / qirçołe/: ئاوەڵناو. قرچۆڵ؛ قرچاو؛ چـرچ و ترینجاو لـە سـووتان ☰ چین و چروک شـدە از سوختگی

**قرچۆڵیـای** / qirçołyay/: چـــاوگ. چۆقـــان؛ هەڵقرچان؛ داخ بوونی ڕۆن ☰ داغ شدن روغن

**قرچە**[1] / qirçe/: نـاو. ١. تـــەوژمی گـــەرما ‹بــەم قرچەی هاوینە پیاسەی چی؟!› ٢. کڵۆش؛ لاسـکی خەڵـە ٣. کـزە؛ سـۆز و ناڵـە ‹دووکەڵـی قرچـەی دەروونی بێ‌جل و بەرگ و ژیـان/ بـوو بـە هـەور و وا بەسەر کێوانەوە، سەیوان ئەکا «قـانع»› ☰ ١. شـدت گرما ٢. ساقەی غلە ٣. سوزش

▣ **قرچەی نیوەڕۆ**: قرچـەقرچی نیـوەڕۆ؛ هـەڕەتی گەرمای نیمەڕۆ ‹شۆڕەژن بنکۆڵ نەکا بڕکەی بـە قرچەی نیوەڕۆ/ چۆن لـە کاڵـەک تێـر دەبـێ ئـەو زگـزلە بێستانڕنە؟ «هێمن»›. هەروەها: **قرچەی تاوسان/ هاوین** ☰ گرمای شدید

▣ **قرچە شکاندن**: نیمـە ورد کـردنی کڵـۆش و بەتایبەت ئالف لە ڕەوتی هۆڵە کردن بـە گـادا ☰ نیم‌کوب کردن ساقەی غلات و علف

**قرچە کردن**: شـکان؛ شـکیان ‹ڕۆژێـک دەگـەڵ برادەرێکا چووینە چاخانەیەک. قوونم خستە سـەر کورسی، قرچەی کرد! «هەژار، *چێشتی مجێـور*»› ☰ شکستن

**قرچە لە دڵ هاتن/ هەستان**: کزە لـە جەرگـەوە هاتن؛ ناڵە لێ هەستان ‹بە هەناسەیەک سـەری دار لەری/ قرچەی لە دڵ هات چەند گەڵای وەری «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ آە از نهاد برآمدن

**قرچە**[2]: دەنگەناو. ١. دەنگـی هەڵـچۆقان لـە سـەر ئاگر (وەک: ڕۆن و گوشت) ‹قرچەی قاورمەی کزەی دڵەی تـەڕ/ ماڵـەوماڵ مەشـۆ، ئـێ پـەڕ تـا ئـەو پـەڕ «مەولەوی»› ٢. دەنگـی سـووتانی شـتی وشـک (وەک: خوێ) ٣. دەنگی پشکووتن و تەقینەوە لـە گەرمان (وەک: دانەبرێشکە لە سەر ساج) ٤. قرپـە؛ دەنگی شکانی شتی وشـک (وەک: دار و ئێسـک) ‹دارەکە قرچەیەکی کرد و شـکا› ٥. تەقەی ترازانی ئێسـک و جومگـە لـە کێشـان و کشـاندا (وەک: پشت و قامک) ‹قرچە لـە پشـتمەوە هـات؛ لەسـەر یەک قرچە لە قامکی دێنێ› ٦. دەنگی دەمی داس لە دروێنەی خەڵەدا ☰ ١. صـدای گـداختن (مانند:

ڕوغن) ٢. صدای سوختن مادەی خشک (مانند: نمک) ٣. صدای شکفتن و بریان شدن (مانند: غلات بر ساج) ۴. صدای شکستن (مانند: چوب و استخوان) ۵. صدای اصطکاک استخوان و مفاصل ۶. صدای داس در حین درو

**قرچەپێ** / qirçepê/: ناو. ڕاستەپێ؛ کاری بەلەز لە بەر پێ(ی کەسێ) هەستان ☰ عمل سریع جلو پا(ی کسی) بلند شدن

**قرچەشکێن** / qirçeş(i)kên/: ناو. کاری تازە بەر پێ خستنی کلۆش کە نەکوتراوە و دەشکێ ☰ نیمکوب ساقەهای غلە در خرمنکوبی

**قرچەقرچ** / qirçeqirç/: دەنگەناو. قرچەی پەیتا ـ پەیتا ‹قرچەقرچ شارەزوور سووتانە «شێرکۆ»› ☰ صدای قرچ ـ قروچ ناشی از سوختن

◙ **قرچەقرچی نیوەڕۆ**: ☜ قرچەی نیوەڕۆ

◘ **قرچەقرچە هاتن**: قرچە کردنی لەسەریەک ‹هەر لە تاوکەوتن هەتا ڕۆژپەڕ، شەوێ تاکوو بەیانی/ وەک کەباب هەر قرچەقرچم بێ، بلا هەروا بسووتێم «ئاوات»›. هەروەها: **قرچەقرچە کردن** ☰ جلزولز کردن

**قرچەک** / qirçek/: ئاوەڵناو. قرچۆک؛ زووبشکێ؛ تایبەتمەندی دارێ کە تورتە و زوو دەشکێ ‹ئەو دارە قرچەکە بۆ گۆچان نابێ› ☰ ویژگی چوب تُرد کە زود بشکند

**قرچەڵۆک** / qirçełok/: ئاوەڵناو. [پلار] قرچۆڵە؛ لاواز و ڕەقەڵە (لەمەڕ ژنەوە) ☰ لاغرمُردنی (برای زنان)

**قرچی** / qirçî/: ناو. نەژد؛ قرچاوی؛ چرچی ☰ چروکیدگی

**قرچیان** / qirç(i)yan/: ☜ قرچان

**قرچیایۆ** / qirç(i)yayo/: چاوگ. قرچانەوە ☰ دوبارە داغ شدن با روغن و...

**قرچینۆک** / qirçînok/: ناو. یەکەم بەری هەنجیر کە دەوەرێ ☰ اولین محصول انجیر

**قرخ**[1] / qirx/: ناو. ١. دەفری سواڵەتی کۆنی سواو ٢. خوری و مووی کورت کە درێژ نابێت ٣. مووی قرتاو (ناحەز) ٤. دار و دەوەنێ کە لە جێگای ڕەق ڕواون و زیاد ناکەن ☰ ١. ظرف سُفالین کُهنە و ساییدە ٢. مو و پشم کوتاە کە رشد نمی‌کند ٣. موی کوتاە شدە (زشت) ۴. درخت و گیاهی کە در زمین سخت روییدەاند

◘ **قرخ کردن**: ١. تاشینی مووی سەر ٢. هەڵپەرتاوتنی دار ☰ ١. زدن مو از بیخ ٢. هرس کردن درخت

**قرخ**[2]: ئاوەڵناو. ١. گەنیوی ڕاوەستاو (ئاو) ٢. دالگۆشت؛ لەڕ؛ لەجەر ☰ ١. راکد گندیدە (آب) ٢. لاغر

**قرخ**[3]: دەنگەناو. دەنگی گەروو لە نەخۆشینەوە ☰ خس ـ خس سینە

**قرخاندن** / qirxandin/: چاوگ. ١. تاشینی مووی سەر ٢. هەڵپەرتاوتن ٣. قرخاندن؛ قرخە کردن ☰ ١. تراشیدن موی سر ٢. هرس کردن درخت ٣. خِرخِر کردن

**قرخم** / qirxim/: ناو. گرخم؛ کوریژ؛ وردە برشتی بەنی تەون ☰ ریزەهای نخ در قالیبافی

**قرخن** / qirxin/: ئاوەڵناو. [پلار] قرخنە: ١. تایبەتمەندی کەسێ کە لە بەر پیری یان نەخۆشی خڕەی گەرووی دێ ٢. لەڕ؛ لاواز؛ دالگۆشت ٣. تایبەتمەندی خوری یان مووی خراپ کە بۆ ڕستن ناشێ ☰ ١. خرخرو ٢. لاغرمُردنی ٣. نامرغوب و غیر قابل ریس (پشم و مو)

**قرخنە** / qirx(i)ne/: ☜ قرخن

**قرخو** / qirxo/: ئاوەڵناو. [پلار] قرخن ☰ خِرخِرو

**قرخۆڵ** / qirxoł/: ئاوەڵناو. [پلار] دالگۆشتی سیس و پیس ☰ لاغر و پژمردە

**قرخۆڵە** / qirxołe/: ئاوەڵناو. [پلار] قرخۆڵی چکۆلە

▇ لاغر و نحیف

**قرخه / qirxe/:** دەنگەناو. خرخـری گـەروو لـە نەخۆشی یان پیری ▇ خِرخِر گلو از پیری یا بیماری

⊡ **قرخه لێ برین:** *[پلار]* خپ کردن؛ خنکانـدن ▇ خفه کردن

**قرخەقرخ / qirxeqirx/:** دەنگەناو. قرخەی پـەیتا ـ پەیتا ‹مامەپیره هـەر قرخەقرخییـەتی و دەرمـانیش ناخوا!› ▇ خِرخِر پیاپی

**قرخەمـەرەزێ[1] / qirxemerezê/:** نـاو. ١. دۆخـی عەیب گرتن و نەسازان ٢. ☜ **قرخەمەرەسێ** ▇ ١. عیبجویی ٢. ☜ **قرخەمەرەسێ**

**قرخەمـەرەزێ[2]:** ئاوەڵـناو. *[پـلار]* کـەمتـووک؛ کولکوەریو ▇ کم‌مو

**قرخەمەرەسێ / qirxemeresê/:** ناو. قرخەمەرەزێ: ١. جۆرێ کایە بـە شـێوەی خـۆ لـە زەوی تونـد کردن بە جۆرێ کە نـەتوانن ڕاسـتی کەنـەوە ٢. کاری بە زۆر ڕاکێشان ‹بە شەو لـە بـن لێفـەدا لـە ترسی مەدرەسە دەگریام و بەیانی بـە قرخەمەرەسـێ دەچوومەوە «هێمن»› ▇ ١. نـوعی بـازی ٢. کشـان ـکشان

**قرخیـایۆ / qirx(i)yayo/:** چـاوگ. قرخـــە لـــێ هەستان ▇ خِرخِر راەانداختن

**قرخێنە / qirxêne/:** ☜ **قرقێتە**

**قرد / qird/:** ☜ **قسر[2]**

**قـردک / qirdik/:** نـاو. کۆسـە؛ لێپـۆک؛ هێلـۆل؛ وشکەڕن؛ ئیشکەڕن؛ دەلی‌دومان؛ دەلوێ‌دومـان؛ گاڵتەجاڕی گەمەی سیرک ▇ دلقک

**قردگ / qirdig/:** ناو. پرزە؛ وردیلە؛ قرتە ▇ ذرّە

**قردیلـە / qirdîle/:** نـاو. جووجەڵـــەی نێـــر؛ کەلەشێری ساوا ▇ جوجەخروس

**قردێلـە / qirdêle/:** نـاو. پارچـــەی باریـــک بـــۆ سەرویرچ بەستن ▇ روبان گیسوبند

**قرژ[1] / qirj/:** ناو. ڕەوتی قوڵتان؛ کولـینی بـەهێز ▇ غلیان

**قـرژ[2]:** ئاوەڵـناو. قـژ: ١. چنگلەئاسـا؛ لێـک‌بـڵاوی سەرچەماو ‹چنگی قرژ کردبوو› ٢. گژ و لێک‌هاڵاو ‹مووی قرژ› ▇ ١. چنگک‌مانند ٢. ژولیده

**قـرژاڵ / qirjał/:** نـاو. ١. ☜ **قرژانگ** ٢. گیفژاڵـە؛ بورجی قرژاڵ؛ وێنەیەکی ئاسمانی چکۆلەیە ▇ ١. ☜ **قرژانگ** ٢. بُرج سرطان

**قرژاڵـە / qirjałe/:** نـاو. قـــرژە: ١. شـــێرپەنجە؛ نەخۆشینی سەرەتان ٢. جۆرێ بـەری دار مـازوو ٣. ڕەوتی پنج بەستنی گەنم ▇ ١. بیماری سرطان ٢. نوعی ثمر مازوج ٣. فرایند چند برگ شدن گندم

**قرژاندن / qirjandin/:** ☜ **قرچاندن**

**قرژانک / qirjank/:** ناو. قەرجلگ؛ کەرکوژە؛ ژاڵـە؛ ڕووڵ؛ ڕووڵک؛ ژاڵک؛ ژەڵـە؛ ژەڵـە؛ ڕیـل؛ ڕویـل؛ لوولک؛ لۆرک؛ لـوێر؛ لـوور؛ لـوورک؛ دارچکێکـی جوانی ژەهراوی، گەڵا ئەستوور، پـر لـەق و پـۆی چەترئاسایە ▇ خرزهره

**قرژانگ / qirjang/:** ناو. قارژنگ؛ قاژنـگ؛ قرژنـگ؛ قرژاڵ؛ قژاڵ؛ قـرژاڵ؛ قـاژنگی؛ قـەرژنگ؛ قژنـگ؛ کرژنگ؛ کەرژنگ؛ کەرکنج؛ کرزلنگ؛ کرجلنـگ؛ خـەرکنج؛ کێفـژاڵ؛ کیفـزاڵ؛ کەڤـژاڵ؛ کیفـژاڵ؛ کیڤژاڵە؛ گیڤژاڵـە؛ گیـژاڵ؛ کیفشـینگ؛ چنگـار؛ گیانەوەرێک بە دوو چاوی قیت و دەرپەڕیو، قاپی پان و ڕەق و یەک یان دوو جـووت شـەویلاکەوە ▇ خرچنگ

**قرژنگ / qirjing/:** ☜ **قرژانگ**

**قرژە / qirje/:** ☜ **قرژاڵە**

**قرس / qirs/:** ناو. خەمڵ؛ بەراورد ▇ برآورد

**قرسـان / qirsan/:** چـاوگ. تێنەپـەڕ. //قرسـای؛ دەقرسێی؛ بقرسـێ// خـەملان؛ بـەراورد بـوون ▇ ارزیابی شدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: قرسـاو/ چـاوگی نـەرێنی: نەقرسان

**قرساندن / qirsandin/:** چاوگ. تێپەڕ. //قرساندت؛ دەقرسێنی؛ بقرسێنە// ١. بەراورد کردن؛ خەملاندن ٢. بە زۆر تێ ئاخنین ◘ ١. برآورد کردن ٢. آکندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەقرساندن

**قرساو / qirsaw/:** ئاوەڵناو. ١. خەملاو؛ بەراوردکراو ٢. تێئاخندراو ◘ ١. ارزیابی شده ٢. آکنده

**قرسیل / qirsîl/:** ناو. ١. لاسکە دەخڵی سەوز ٢. سەمەڵ؛ بەرماوی لەوەڕ ◘ ١. ساقەهای سبز غلّه ٢. پسماندەی چرای دام

**قرش / qirş/:** ناو. ١. چڵەکا؛ گیای بابردەڵە ٢. پوولەکەماسی ٣. لکی شکاوی وشک ◘ ١. پر کاه ٢. فلس ماهی ٣. شاخەی خُشک و شکسته

**قرشک / qirşik/:** ناو. قرشوقاڵ؛ چیلکەوچاڵ؛ پڕوپووش ◘ خس و خاشاک

**قرشماڵ / q(i)rişmał/:** ئاوەڵناو. [پلار] بێحەیا؛ بێشەرم ◘ بی‌شرم؛ قرشمال

**قرشوقاڵ / qirş û qał/:** ☜ قرشك

**قرشە / qirşe/:** ناو. کڵۆشی سەر خۆیان ◘ ساقەهای غله بر خرمن

**قرشی / qirşî/:** ناو. بەڵمی هەرزن و چەڵتووک ◘ کاه ارزن و شالی

**قرقران / qirq(i)ran/:** چاوگ. سرەوتن؛ ئۆقرە گرتن ‹هیچ قرقرانی بۆ نییە، تەواو بێتاقەتی کردووین› ◘ آرام گرفتن

**قرقرتۆک / qirqirtok/:** ناو. قلقک؛ کرۆژە؛ کرۆچەنە ◘ غُضروف

**قرقرویچک / qirq(i)rûyçik/:** ناو. قرقلتۆک؛ کرۆژە؛ قرتێنکە؛ زەنگەلۆر؛ کرکراکە؛ کرۆچەنە ◘ غضروف؛ کرکرک

**قرقرە / qirq(i)re/:** ناو. بەکرە؛ چەرخەک؛ غەرغەرە؛ مەکارە ◘ قرقره

**قرقلتۆک / qirqiltok/:** ☜ قرقرویچك

**قرقۆک / qirqok/:** ئاوەڵناو. وشک؛ وسک ◘ خُشک

**قرقێنە / qirqêne/:** ☜ قرقێتە

**قرک / qirk/:** ☜ قەلەڕەش

**قرکێش / qirkêş/:** ناو. نەخۆشییەکە لە گەروو دێت ◘ از بیماری‌های گلو

**قرگە / qirge/:** ناو. بەرێکی دار مازوو ◘ نوعی ثمر مازوج

**قرم[1] / qirm/:** ناو. ١. کاری تێڕاخوڕین ٢. ئیشتیا؛ ئارەزوو ◘ ١. نهیب ٢. هوس؛ آرزو

▣ **قرم (لە شتێ) خۆش کردن:** [پلار] تەما (لە شتێ) کردن؛ کەوتنە تەماوە ‹ماچی دەمی لە کەلکەلە مابوو، چ خۆشی وت:/ قرم ئەی ئەسیری واهیمە! خۆش ناکرێ لە هیچ «مەحوی»› ◘ طمع (در چیزی) کردن

**قرمی کەسێ پڕ بوون:** [مەجاز] زۆر قەڵس و جاڕز بوون ‹قرمی پڕە، جارێ قسەی لەگەڵ مەکە!› ◘ توپ کسی پُر بودن

**قرم[2]:** دەنگ. تەقەی بەرکی چەک ◘ صدای شلیک

**قرماخە / qirmaxe/:** ☜ قەتماخە

**قرماغە / qirmağe/:** ☜ قەتماخە

**قرمان / qirman/:** چاوگ. ١. پێکەوە نووسان (زار) ٢. سڕ بوون ‹دەستم قرمایە› ◘ ١. بە هم آمدن (دهان) ٢. بی‌حس شدن

**قرماندن / qirmandin/:** چاوگ. تێپەڕ. //قرماندت؛ دەقرمێنی؛ بقرمێنە// قرمنای: ١. تێڕاخوڕین ‹بە سەریدا قرماندی› ٢. سڕ کردن ٣. تەقە لە چەکەوە هاتن ٤. گرماندن؛ نالینی هەور ◘ ١. نهیب زدن ٢. بی‌حس کردن ٣. صدا از سلاح درآمدن ٤. غُریدن ابر

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەقرماندن

**قرمچ[1] / qirmiç/:** ناو. ڕەوتی قرچانی پێست؛ چرچ هەڵگەڕان ◘ حالت چروک شدن پوست

**قرمچ**[٢]: ناو. چرچ؛ لۆچ ☰ مُچاله

**قرمچاندن / qirm(i)çandin/**: چاوگ. گلـۆفین؛ گلفچاندن ☰ مُچاله کردن

**قرمچی / qirm(i)çî/**: ناوەڵناو. ١. قرچاو؛ هەڵقرچاو ٢. چرچبوو ☰ ١. چین خورده؛ چروکیده ٢. مُچاله

**قرمچین / qirm(i)çîn/**: چاوگ. ١. ترنجانی پێست ٢. چرچ و لـۆچ بـوون ☰ ١. چروکیـدن پوسـت ٢. مُچاله شدن

**قرمز**[١] **/ qirmiz/**: ناو. سوور؛ سۆر؛ خاز ☰ قرمز

**قرمز**[٢]: ناوەڵناو. سوور؛ سۆر؛ خاز؛ به ڕەنگی سووری ئاچخ ☰ قرمز

**قرمزی / qirm(i)zî/**: نـاو. ١. سـوور؛ قرمـز ٢. سووری ☰ ١. قرمز ٢. سُرخی

**قرمژن / qirmijn/**: ناو. گرمه؛ دەنگـی تەقـەی زل ‹لـه بـاتی قاسپەقاسـپی کـەو/ دەهـات قرمژنـی شێستتیرێ «هێمن»› ☰ غُرُنبه؛ صدای مهیب

**قرمساندن / qirm(i)sandin/**: چـاوگ. نووقانـدن؛ قووچاندن (چاو) ☰ بر هم نهادن (چشم)

**قرمنای / qirmnay/**: ☜ **قرماندن**

**قرم و قاڵ / qirm û qał/**: ناو. زەنازەنـا؛ دەنـگ و هەرای زۆر ☰ سر و صدای زیاد

**قرمه**[١] **/ qirme/**: نـاو. ١. جـۆرێ تفـەنگی ڕاو ٢. جۆرێ دروومان ☰ ١. نوعی تفنگ ٢. نوعی دوخت

**قرمه**[٢]: دەنگەناو. ١. دەنگی بەرکی چـەک ‹ڕۆژانـه هەر گرمەی تەیاره و قرمەی شێستیر و زرمەی تۆپان و نالەی بۆمبـا بـوو «هـەژار، چێشـتی مجێـور»› ٢. دەنگی شکانی کۆتەره دار ☰ ١. صدای شـلیک ٢. صدای شکستن تنەی درخت

**قرنج / q(i)rinc/**: نـاو. ١. ڕووش؛ ڕیـش؛ خاشـە؛ کیر؛ ڕووکاوی ٢. درز؛ دەرز؛ قەڵشـی کـەم ☰ ١. خراش سطحی ٢. درز

**قرنجان / q(i)rincan/**: چـاوگ. تێنەپەڕ. //قرنجـای؛ دەقرنجێ؛ بقرنجێ// قرنجیان؛ قرینجیان؛ قنجان؛ قرنجیای: ١. ڕووشانی پووک و پێست بـه هـۆی لێ کەوتنی شتی تیژ ‹بـەردم پێـدا کـەوت، شـانم قرنجـاوه› ٢. درز بـردن ‹شیشـەی ماشـینەکه قرنجـاوه› ☰ ١. خـراش سـطحی برداشـتن ٢. درز برداشتن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: قرنجـاو/ چـاوگی نـەرێنی: نەقرنجان

**قرنجانـدن / q(i)rincandin/**: چـاوگ. تێپـەڕ. //قرنجانـدت؛ دەقـرنجێنی؛ بقرنجێنـه// قرنجـانن؛ قنجانـدن؛ قرنجنـای: ١. ڕووشـاندنی پـووک و پێسـت ٢. درز پـێبـردنی کـەم ☰ ١. خراشـیدن سطحی ٢. شکافتن جزئی

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: ـــ/ چـاوگی نـەرێنی: نەقرنجاندن

**قرنجانن / q(i)rincanin/**: ☜ **قرنجاندن**

**قرنجـاو / q(i)rincaw/**: ئاوەڵـناو. ١. ڕووشـانی پێست به هۆی گوشـران ‹لێـوی قرنجـاو› ٢. درز بردوو ☰ ١. خراشیده ٢. درز افتاده

**قرنجنای / q(i)rincnay/**: ☜ **قرنجاندن**

**قرنجیان / q(i)rinc(i)yan/**: ☜ **قرنجان**

**قرنجیای / q(i)rinc(i)yay/**: ☜ **قرنجان**

**قرنفل / q(i)rinfil/**: ☜ **قەرەنفول**

**قرنگ / q(i)ring/**: ناو. ڕەوتی لـەنگین؛ ڕۆیشـتنی شەلانه ☰ لنگیدن

**قرنگه / q(i)ringe/**: دەنگەناو. دەنگی وێک‌کەوتنی کانزا ☰ صدای به هم خوردن فلزات

**قرنور / qirnur/**: ناو. بەرێکی دار مازووه که به قەد گۆیژێکه ☰ نوعی ثمر درخت مازوج

**قرنیچک / qirnîçik/**: نـاو. تەپۆ؛ پێشکەی دندووک درێژ ☰ نوعی پشەی دُرُشت

**قرنیز / qirnîz/**: ☜ **قەڕنیز**

**قرنیس / qirnîs/**: ئاوەڵـناو. /بِلار/ مـاڵ‌پـارێز؛ ڕژد؛ چکووس؛ سەقیل ☰ خسیس

**قروقپ** / qir û qip/: ناو. پەنای بێدەنگ؛ فەنای بێدەنگ؛ کایەی وسکوت ☰ بازیِ خاموشی و سکوت

**قرۆت** / q(i)rot/: ☜ **قرۆپ**

**قرۆش** / q(i)roş/: ناو. قورۆش: ١. وردە پوولْ ٢. پوولێکی ترکانی عوسمانی ☰ ١. پول خُرد ٢. از واحدهای پول عثمانی

**قرۆشکە** / q(i)roşke/: ناو. پیاڵەی دەسکداری ڕۆکێش ☰ پیالەی لعابی دستەدار

**قرۆقە** / q(i)roqe/: ☜ **قورۆقە**

**قرووسکاندن** / q(i)rûskandin/: چاوگ. کرووزاندنی سەگ لە لێداندا ☰ زوزەی سگ

**قرووسکە** / q(i)rûske/: دەنگەناو. دەنگی سەگ لە لێداندا ☰ صدای زوزەی سگ

**قرووسکە، قرووسک** / q(i)rûske q(i)rûsk/: دەنگەناو. قرووسکەی لە سەر یەک؛ دەنگی لە پەستای سەگ لە کاتی لێداندا ☰ زوزەی پیاپی سگ

**قرووش** / q(i)rûş/: ئاوەڵناو. جینگن؛ تووش و نالەبار ☰ ستیزەجو

**قرهاندن** / qirhandin/: چاوگ. ١. ماندوو کردن ٢. سەر لێ شێواندن ☰ ١. خستە کردن ٢. گُمراه کردن

**قری** / q(i)rî/: ☜ **قرِقێتە**

**قریان** / qiryan/: چاوگ. هەدا دان؛ ئۆقرە گرتن؛ هێدی بوون ☰ آرام گرفتن

**قریپ** / q(i)rîp/: ☜ **قریو**

**قریپک** / q(i)rîpik/: ناو. سێ شەشی سەرەتای بەهار ☰ هجدە روز اول بهار

**قریسک** / q(i)rîsk/: ناو. ئاورینگ؛ پرۆسک؛ پرشنگ؛ برووسکە ☰ شرارە

**قریشکاندن** / q(i)rîşkandin/: چاوگ. تێنەپەڕ. //قریشکاندت؛ دەقریشکێنی؛ بقریشکێنە// ١. قیژاندن؛ قیژەکێشان ٢. پێکەنین و تریقانەوەی منداڵی بچووک ☰ ١. جیغ کشیدن ٢. قهقهە زدن نوزاد

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـــ/ چاوگی نەرێنی: نەقریشکاندن

**قریشکنای** / q(i)rîşknay/: چاوگ. قریشکە کردن ☰ جیغ کشیدن

**قریشکە** / q(i)rîşke/: ناو. ١. زیرە؛ قیژە ٢. دەنگی پێکەنینی منداڵ ☰ ١. جیغ ٢. صدای قهقهە کودک

**قرینجیان** / q(i)rînc(i)yan/: ☜ **قرنجان**

**قریو** / q(i)rîw/: ناو. قریپ؛ هۆل؛ دەنگی بەرز و بەهەیبەت ☰ غریو

**قریواندن** / q(i)rîwandin/: چاوگ. قریوانن؛ گوڕڕە و هەرا کردن ☰ بانگ و غریو سر دادن

**قریوانن** / q(i)rîwanin/: ☜ **قریواندن**

**قریونای** / q(i)rîwnay/: چاوگ. قریواندن ☰ بانگ و غریو سر دادن

**قریوە** / q(i)rîwe/: ناو. هەرا و هوریا لە خۆشیان ‹قریوە و داوەت و چۆپی و سەمایە/ گەپ و گاڵتە و زەماوەند و هەرایە «هێمن»› ☰ هورا و هلهله

**قریوەقریو** / q(i)rîweq(i)rîw/: ناو. قریوەی پەساپەس ☰ هلهلەی بسیار

**قرێتە** / q(i)rête/: ☜ **قلآدە**

**قرێژ**[1] / q(i)rêj/: ناو. ١. گەمار؛ چلک و پیسی ٢. کرێژی سەر ☰ ١. کثافت ٢. شورەی سر

**قرێژ**[2]: ئاوەڵناو. چلکن؛ زیرگن؛ ناتەمیس ☰ کثیف

**قرێژاهی** / q(i)rêjahî/: ناو. چلک و پیسی ☰ کثافت

**قرێژۆک** / q(i)rêjok/: ناو. کون و دیوی ژوورەوەی گوێ ☰ گوش میانی

**قرێژەبەرد** / q(i)rêjeberd/: ناو. کرێژ؛ کرێژ؛ کرێش؛ کرێژەبەرد؛ کرێژەبەرد؛ قۆزەبەرد؛ گڵەوەز؛ گوڵەوەر؛ مەخمەڵێنە؛ بڤز؛ خەنەتیفک؛ خەنەتیفک؛ خەنەتیلکە؛ بەرەزا؛ گیابەردینە؛

گیایەکی بۆری شینباو یان قاوەیی و سووورە کە وێڕای جلشین و قەوزە لە سەر بەرد و دار و دەوەن دەڕوێ ≡ گُلسنگ

**قڕ**[1] / qiř/: ناو. ١. قڕاف؛ زوقم؛ خویس؛ خووس ٢. سەرداێ سەرما ٣. کپی؛ بێدەنگی ٤. سووڕ؛ خول ≡ ١. پژ؛ سرماریزه ٢. سرما ٣. خاموشی ۴. قِر

⊡ **قڕ دان**: قنگ بادان ≡ قِر دادن

**قڕ هاتن**: ناز و نووز کردن ≡ ناز کردن؛ عشوه آمدن

**قڕ هاتن**: ناز و نووز کردن ≡ ناز کردن؛ عشوه

**قڕ**[2]: ناوەڵناو. ١. کڕ؛ کپ؛ بێدەنگ ٢. خنکاو؛ خنکیاگ؛ گەوخاو؛ تاساو ٣. نابوود؛ فەوتاو؛ هیچ لێ نەماو ‹نە پڕ، نە قڕ «مەسەل»› ٤. بڕاو؛ دابڕاو؛ داپچڕاو؛ پساو ٥. بەناز؛ چەلەنگ؛ بەعینوان؛ بە تەوروتووز ‹کچێکی قڕی لەگەڵدا بوو› ≡ ١. ساکت ٢. خفه ٣. نابود ۴. مُنقطع ۵. با ناز و ادا

⊡ **قڕ بوون**: ١. قڕ پێوەر بوون؛ قڕ تێکەوتن؛ تێکڕا مردن ٢. خنکان لە بێئاوی ≡ ١. مُردن همگانی ٢. خفه شدن از تشنگی

**قڕ پێوەر بوون**: ☜ **قڕ بوون-١**

**قڕ تێخستن**: ☜ **قڕ کردن -١**

**قڕ تێکەوتن**: ☜ **قڕ بوون-١**

**قڕ کردن**: ١. قڕ تێخستن؛ لە ناو بردنی بە کۆمەڵ ٢. خنکان لە تینوویەتی ‹چەند کەس لە تینوەتی قڕیان کردووە› ≡ ١. از بین بردن همگانی ٢. مُردن از تشنگی

**قڕ هاتن**: بە تەواوی مردنی هەموان ≡ مُنقرض شدن

**بە قڕ چوون**: بە کوشت چوون ≡ کُشته شدن

**بە قڕ دان**: بە کوشت دان ‹ئەلحەزەر مەحوی لە نەوحەی بێگوناهان ئەلحەزەر/ ئاوی چاوی بوو جیهانی دا بە قڕ تۆفانی نووح «مەحوی»› ≡ بە کُشتن دادن

**خۆ قڕ کردن**: ١. خۆ خنکاندن ٢. خۆ چەلەنگ کردن؛ بە تەور و تووز کردن ‹خۆی قڕ ئەکا و دێتە دەرێ› ≡ ١. خود را خفه کردن ٢. خود را آراستن

**قڕ**[3]: دەنگ. دەنگی زلی باڵدار ≡ صدای بم پرنده

**قڕاڕک** / q(i)řařik/: ☜ **قالاو**

**قڕاش** / q(i)řaş/: ناو. ١. قاش لە میوە ٢. لەت؛ کوت؛ پارچە ≡ ١. قاچ؛ برش از میوه ٢. پاره

**قڕاش ـ قڕاش** / q(i)řaşq(i)řaş/: ناوەڵناو. لەت ـ لەت؛ پارچە ـ پارچە ≡ پاره ـ پاره

**قڕاف** / q(i)řaf/: ناو. خووسار؛ سیخوار؛ زوقم ≡ پژ؛ سرماریزه

**قڕاقڕ** / q(i)řaqiř/: دەنگەناو. زەنا ـ زەنا ≡ سروصدا

**قڕاک** / q(i)řak/: ☜ **قالاو**

**قڕاکە** / q(i)řake/: ناو. قڕاکەسەوز؛ قژاکەشینکە؛ قژالکەشینە؛ قیژۆک؛ کاسەڵەشینکە ≡ سبزقبا

**قڕاکەسەوز** / q(i)řakesewz/: ☜ **قڕاکە**

**قڕاڵ** / q(i)řał/: ناو. پاتشا؛ پاشا ≡ پادشاه

**قڕاڵێ** / qřałê/: ناوەڵناو. گنخاوی تێکوڵ ترینجاو بە دارەوە (گوێز) ≡ خشکیده بر درخت (گردو)

**قڕان**[1] / q(i)řan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //قڕای؛ دەقڕێی؛ بقڕێ// ١. قڕ بوون؛ قڕ تێکەوتن؛ مردنی بە کۆمەڵ ‹بۆ قڕانی لەشکری ئەعدا لە ناکاو میسلی بەرق/ ئاسەفی ساحێبقران، لەعلی بەدەخشان هاتەوە «شێخ ڕەزا»› ٢. خوێندنی قالاو ‹زستانی ژیانە وا قەلی مەرگ قڕی/ پیری ملەیەک بوو ڕەگی لاویمی بڕی «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ≡ ١. مُردن ٢. قارقار خواندن کلاغ

■ ناوەڵناوی بەرکاری: قڕیو/ چاوگی نەرێنی: نەقڕان

**قڕان**[2]: ناو. قران؛ قەران؛ ڕیاڵ؛ یەکەی پارەی ئێرانی ≡ قران؛ واحد پول ایران

**قڕاندن** / q(i)řandin/: چاوگ. تێنەپەڕ. تێپەڕ. //قڕاندت؛ دەقڕێنی؛ بقڕێنە// قڕانن: ◻تێپەڕ. ١.

خوێندنی قالاو ٢. [کینایە] نوخشانەی خـراپ لـێ دان ‹وسوو: کوێخـا بـایز ئەترسـم زسـتانی ئەمسـاڵ سەختتر و دژوارتر بێ لە هی پار/ کوێخـا: نـا ... مـام وسوو ... مەقڕێنە! «شێرکۆ»› ٣. ◻ تێـەر. ڕچانـدن؛ تراو کردنە سـەهۆڵ ☰ ١. قارقـار کـردن کـلاغ ٢. نفوس بد زدن ٣. مُنجمد کردن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەقڕاندن

**قڕانگە / q(i)ȓange/**: ناو. جێگـەی بڤـە؛ شـوێنی خەتەر ☰ مهلکه

**قڕانن / q(i)ȓanin/**: ☜ **قڕاندن**

**قڕباق / qiȓbaq/**: ☜ **قڕبۆق**

**قڕبۆز / qiȓboz/**: ناوەڵناو. برنجی؛ ماش و برنجـی؛ سەر و ڕیش تێکەڵاو لە مـووی سـپی و ڕەش ☰ جوگندمی (مو)

**قڕبـۆق / qiȓboq/**: نـاو. قرپـک؛ قرپـۆک؛ قـڕباق؛ قرپۆق؛ قرپۆک؛ قوربۆق؛ قربۆق؛ قـڕواق؛ قوربـاق، قـورواق؛ قـوڕاق؛ قەرواقـە؛ شـاقروان؛ هـەفتجار؛ گیانەوەرێکی بەژـ ئاوی کە پتر لـە ئـاودا دەژی و کلک و ملی نییە و هەڵدەبەزێ ☰ قورباغه

**قڕپۆق / qiȓpoq/**: ☜ **قڕبۆق**

**قڕپـۆک / qiȓpok/**: نـاو. ١. ☜ **قڕبـۆق** ٢. ☜ **قرپۆك**

**قڕتیان / qiȓt(i)yan/**: چاوگ. ١. قرتان؛ بـە ددان پسان ٢. بران؛ بریان؛ پسان ☰ ١. بـا دنـدان قطـع شدن ٢. پاره شدن

**قڕتێکـەوتـو / qiȓtêkewtû/**: ناوەڵـناو. بـالمیش؛ تەفر و توونا؛ بنەبڕ ☰ نابود

**قڕڕە / qiȓȓe/**: ☜ **قڕە**

**قڕژاڵ / qiȓjał/**: ☜ **قرژانگ**

**قڕقـاپ / qiȓqap/**: دەنگ. وس؛ وسـکوت؛ وشـەی دنە دان و فرمان دان بە بێدەنگ بوون ☰ هیس؛ کلمەی واداشتن به سکوت

**قڕقڕ[١] / qiȓqiȓ/**: نـاو. بالـندەیەکە لـە تۆرەمـەی قورینگ، نزیک میترێک دەبێ، کاکۆڵـی هەیـە و بە لاملیدا هاتۆتە خوار، لـە دەشـت و بـانوان لـە قەراخ ئاو و زەلکاواندا دەژی و کۆچەرە ☰ دُرنـای کوچک

**قڕقڕ[٢]**: دەنگەناو. قۆڕە؛ قـڕە؛ دەنگـی نـاو زگ ‹لـە دوازدەی دێمەوە، برسیمە، ماندووم، قڕقڕی زگمە/ کە ورگی لامەزەب تا مل پڕی شۆربا نەکـەم، چ بکـەم؟! «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ قار و قور

**قڕقڕاچکە / qiȓq(i)ȓaçke/**: ☜ **قوڕقوڕاگە**

**قڕقڕاگە / qiȓq(i)ȓge/**: ☜ **قوڕقوڕاگە**

**قڕقڕتـۆک / qiȓqiȓtok/**: نـاو. ١. قڕقڕاچکـــە؛ قوڕاچکە؛ بینەقاقە؛ دەرناق؛ ٢. کرۆژە؛ کرۆچەنـە؛ کرکراکە ☰ ١. خِرخِرە ٢. غُضروف

**قڕقڕۆچکە / qiȓq(i)ȓoçke/**: ☜ **قوڕقوڕاگە**

**قڕقـرە / qiȓq(i)ȓe/**: نـاو. غەرغـەرە؛ غەرغـەڕە؛ غەڕەغەڕە؛ قەنەک؛ کاژ؛ مەکارە؛ بـەکرە؛ ماقرنـە؛ ماقرنـە؛ گەرگـەڕە؛ کرکـرە؛ خلـۆکە؛ خلـۆک؛ خولخولۆکە؛ خلێنکە؛ خرخرە؛ خلووتە؛ خرنـەک؛ گـاج؛ تەشـیلە؛ دارتـوون؛ چـرێک؛ چـرک؛ چەرخەک؛ چەرخەکی؛ لوولک؛ لا؛ گلیلێکـی دوو سەر پان، بۆ هەڵکردن و هەڵگرتنی ڕیسـە (بـەن، تەل، کابل و...) ☰ قرقره

**قڕقێنە / qiȓqêne/**: ناو. قرپ؛ قرپە؛ قرخێنە؛ قری؛ قلپک؛ قورقێنە؛ قوژپێنە؛ قولپک؛ قولقێنە؛ قورپ؛ قرقێنە؛ قولێنک؛ پرقێنە؛ قورقێنە؛ گازی گەدە کە بە دەنگەوە لە دەم دەردێ. هەروەها: **قرقێنـە دان** ☰ آروغ

**قڕک / qiȓk/**: نـاو. ١. ☜ **قالاو** ٢. خراپی گەردن؛ گوێزەی ئەستۆ ☰ ١. ☜ **قالاو** ٢. سیب آدمی

**قڕگ / qiȓg/**: ☜ **قوڕو**

**قڕم / qiȓm/**: نـاو. مالەغان؛ کـەرەمتوو؛ کەلەنـدی ☰ داس بلندی که ایستاده به کار میبرند

**قڕنابیت / qiȓnabît/**: ناو. گوڵی کەلەم ☰ گُل کلم

**قڕنۆ / qiřno/**: ناو. ساسی؛ سۆنی؛ پنـد؛ جووجـوو ☰ ساس

**قڕنو / qiřnû/**: ناو. قڕنە؛ قـڕنی؛ قـەڕنی؛ قوڕنـوو؛ کـڕنگ؛ کـڕنوو؛ کـڕنی؛ پکەولـە؛ مێرووییـەکی پانکەڵەی سوورە بە ئاژەڵەوە دەنووسـێ ☰ قـراد؛ حشرەای کنه مانند

**قڕنە / qiřne/**: ☜ **قڕنو**

**قڕنەگومە / qiřnegume/**: ☜ **قڕنەگۆمە**

**قڕنەگۆمە / qiřnegome/**: ناو. قڕەگۆمە؛ قڕەگومە؛ قڕنەگومە؛ کایە و کاری یەکتر قوم کردن لە کاتی مەلەدا ☰ بازی سـر همـدیگر را در آب فـرو کـردن هنگام شنا

**قڕنی / qiřnî/**: ☜ **قڕنو**

**قـڕنیس / qiřnîs/**: ئاوەڵـناو. ١. چیـڕ؛ نـەگونجاو؛ سەرسـەخت لـە قسـەی خۆیـدا ٢. *[کینایە]* ڕژد؛ چنووک ☰ ١. لجوج ٢. خسیس

**قڕنـای / qiřnay/**: چـاوگ. ١. قڕانـدن؛ قـڕانن ٢. دەستی ـ دەستی پێ کردن ☰ ١. نفوس بـد زدن ٢. امروز- فردا کردن

**قڕواق / qiřwaq/**: ☜ **قڕبۆق**

**قڕوچیـرەک / qiř û çîřek/**: نـاو. هەراهـــەرا؛ شەڕەقسە ☰ مُجادله

**قڕ و فڕ / qiř û fiř/**: ناو. *[پلار]* قڕ و نیمقڕ؛ کـاری خۆ جوان کردن بۆ سەرنج ڕاکێشـانی خەڵـک ☰ قر و فر

◘ **قڕ و فڕ لێ دان**: خـۆ ڕازاندنـەوە ‹هـەر سـکالام کرد، لێت پاڕامەوە/ لە سەر من کەچی لێت دا قڕ و فڕ «ئاوات»› ☰ آرایش کردن

**قڕوقـپ[1] / qiř û qip/**: نـاو. قڕوقـەپ؛ قوڕوقـەپ؛ قەپوقڕ؛ کڕی؛ کپی؛ بێدەنگی ☰ سکوت

**قڕوقپ[2]**: ئاوەڵناو. قڕوقـەپ؛ قوڕوقـەپ؛ قـەپوقـڕ؛ کپ؛ بێدەنگ ‹دنیای قڕوقپ› ☰ ساکت؛ خاموش

**قڕوقـە / qiř û qe/**: نـاو. ڕەوتی بـڵاوە کـردنی سواران بە پرتاو ☰ حالت پراکنده شـدن سـواران بـا تاخت

**قڕوقەپ / qiř û qep/**: ☜ **قڕوقپ**

**قڕوقەپۆز / qiř û qepoz/**: ناو. *[پلار]* قوڕوقـەپۆز؛ دەموفلچ؛ لچ و لێو ☰ لب و لوچه

**قڕونیمقڕ / qiř û nîmqiř/**: نـاو. ١. قڕوفـڕ؛ نـاز و نووز ٢. جۆرێ پارچەیە ☰ ١. ناز و عشوە ٢. نـوعی پارچه

**قـڕۆپ / q(i)řop/**: ناو. قرۆت؛ شەپلە؛ ئیفلیجـی ☰ بیماری فلج

**قڕۆنێ / q(i)řonê/**: ☜ **قورئان**

**قـڕە[1] / q(i)ře/**: نـاو. قـــڕڕە: ١. چەقــە؛ زەنازەنـا ‹قرپۆک بە قـڕە زل نابـێ› ٢. دوامـین کـەس لـە یاریدا ☰ ١. سروصدا ٢. قاق؛ آخرین نفر بازی

**قڕە[2]**: دەنگ. قـڕڕە: ١. هـەراوهوریا؛ دەنگـەدەنگ ‹ئێژێ پات خوارە ڕانکەکەت شڕە/ لەم هەرا و قڕە زۆر دڵم پڕە «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ٢. دەنگی بۆق ٣. دەنگی قالاو ‹قڕەی قـەل بـۆ هـەنجیرە› ٤. قـۆڕە؛ دەنگی ناو زک ☰ ١. سروصدا ٢. صدای قورباغـه ٣. صدای کلاغ ۴. قاروقور شکم

**قڕەپیرێـــژن / q(i)řepîrêjin/**: نـــاو. جۆرێـــــک هەڵپەڕکێی حەماسییە، پێش شەڕ بۆ خـۆ ئامـادە کردن و هێرش بردن دەکـرێ ☰ نـوعی پـایکوبی حماسی

**قـڕەڕەشـە / q(i)řeřeşe/**: نـاو. ١. نەخۆشـــییەکی سەختی پاتاڵ ٢. *[مەجاز]* مەرگی هەمووانی ☰ ١. بیماری کشندەی حیوانات ٢. مرگ و میر همگانی

**قڕەقڕ / q(i)řeqiř/**: دەنگ. دەنگـی وەک قیـڕە و هەرای قشقەڕە و قڕبۆق و ... ‹قەل بە خێو کـەی، قڕەقڕ بەشتە «مەسەل»› ☰ صدای شبیه قارقار کلاغ و زاغ

**قڕەگومە / q(i)řegume/**: ☜ **قڕنەگۆمە**

**قڕەگۆمە / q(i)řegome/**: ☜ **قڕنەگۆمە**

**قڕەون / q(i)řewin/**: ئاوەڵناو. شـەڕەون؛ شـەڕانی؛ جەنگەرانی ☰ آشوبگر

**قڕهاتو / qiřhatû/**: ئاوەڵناو. دوابـڕاو؛ دوابـڕیاگ؛ دوابڕیاو ☰ ریشەکن‌شدە

**قڕی / q(i)řî/**: ناو. ١. گرانی؛ قـاتی ٢. تینوویـەتی ☰ ١. قحطی ٢. تشنگی

**قڕیای / qiřyay/**: چاوگ. دەستی ـ دەسـتی پـێ کران ☰ امروز- فردا کردن

**قڕین / q(i)řîn/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //قـڕیت؛ دەقـڕی؛ بقڕە// خوێندنی قاڵاو و بۆق و ... ☰ آواز سر دادن کلاغ و قورباغه و ...

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: قڕیو/ چاوگی نەرێنی: نەقڕین

**قڕێژ / q(i)řêj/**: ئاوەڵناو. لەوت؛ لەیم؛ لیم؛ کرێژ ☰ پلید

**قڕێن / q(i)řên/**: نـاو. ١. کـاری چەقـە کـردن پێکـەوە ٢. چۆنیـەتی قێڕانـدن؛ جقانـدن ☰ ١. مُجادله ٢. داد و هوار

**قز / qiz/**: ناو. ١. کچ؛ دۆت ٢. گۆی یاری شەقێن ☰ ١. دختر ٢. گوی چوگان بازی

**قزبان / qizban/**: ☜ **قەزوان**

**قززڵقورت / qizziłqurt/**: ☜ **قوزوڵقورت**

**قزگە / qizge/**: ناو. ئەو شوێنەی لەوێوە بە گۆچان لە گۆ دەدەن ☰ میدان گوی‌بازی

**قزلان / qizlan/**: نـاو. تیرەیەک لە ئێزەدییەکان لە کوردستان ☰ تیره‌ای از ایزدیان در کردستان

**قزڵ / q(i)ził/**: ئاوەڵـناو. دەم و چاو سوور (پـەز) ☰ سر و صورت قرمز (گوسفند)

**قزڵباش / q(i)ziłbaş/**: نـاو. چەکـداری لەشـکری سەفەویانی ئێران ☰ قزلباش

**قزڵپەنجەرە / q(i)ziłpencere/**: ناو. پەنجـەرۆک؛ گیایەکە ☰ گیاهی است

**قزڵقورت / q(i)ziłqurt/**: ☜ **قوزوڵقورت**

**قزڵمامزی / q(i)ziłmam(i)zî/**: ناو. ناوی گیایەکـە ☰ گیاهی است

**قزڵمامەسی / q(i)ziłmamesî/**: نـاو. گیایـــەکی دڕکاوی گوڵ بنەوشە، لـە نێـو گەنمـدا دەڕوێ و نیو میترێک باڵا دەکا ☰ گیاهی است

**قزە / q(i)ze/**: ئاوەڵناو. *[پلار]* ترسنۆک؛ ترسـەنۆک؛ ترسەزاوەر ☰ بُزدل

**قزەڵقورت / q(i)zełqurt/**: ☜ **قوزوڵقورت**

**قژ[1] / qij/**: نـاو. ١. تووکەسەر ٢. قژە؛ توێژی سـەر تراوی ترشاو ☰ ١. موی سـر ٢. لایـەی روی مـایع تُرشیده

⊡ **قژ بوون:** *[مەجاز]* بەزین؛ بۆڕ خواردن ☰ شکست خوردن

**قژ کردن:** ١. چنگ قرژ کردن ٢. توێژ هێنـان و گرژ بوونی تراوی ترشاو ٣. هاتنە بـانی ماسـت لە ڕەوتی ترشـانیدا ☰ ١. انگشـتان را بـه شـکل چنگک درآوردن ٢. کف برآوردن مـایع تُرشـیده ٣. بالا آمدن ماست در حال تُرشیدن

**قژ[2]**: دەنگ. ١. دەنگی بەچکەمەل کاتێ کە دایکی دێتەوە لای ٢. دەنگی چێشکە لە کاتی ترسدا ☰ ١. صدای جوجه هنگامی کـه مـادرش را مـی‌بینـد ٢. صدای گنجشک ترسیده

**قژاک / q(i)jak/**: ناو. ١. قاژوو؛ قەلەبازەڵە؛ قشقەڕە ٢. ☜ **قاڵاو** ☰ ١. زغن ٢. ☜ **قاڵاو**

**قژاکە / q(i)jake/**: ☜ **قژاوکە**

**قژاکەشینکە / q(i)jakeşînke/**: ☜ **قڕاکە**

**قژاڵ / q(i)jał/**: ☜ **قرژانگ**

**قژاڵکە / q(i)jałke/**: ☜ **قژاوکە**

**قژاڵکەشینە / q(i)jałkeşîne/**: ☜ **قڕاکە**

**قژانک / q(i)jank/**: ☜ **قژانگ**

**قژانگ / q(i)jang/**: نـاو. قژانک؛ پووک؛ پووکاوڵـە؛ چەمۆڵە؛ چەمبۆڵە ☰ حالت یـا عمـل ام کـردن بـا دست

**قژاوکە / q(i)jawke/**: ناو. قژاکە؛ قژاڵکە؛ بـۆرەک؛

حەوتزمانکە؛ باڵندەیەکە لە تورەمەی قەل، نزیک ٣٥ سانتیمیترە، لەشی قاوەیی کاڵ و ئاتەگی سپییە، شاباڵی ڕێ ـ ڕێ شین و ڕەشە، تووکی سەری ڕەشی بەڵەکە و جارـ جار جغە هەڵدەدا، بە گەل دەژی و پڕ قاژ و قووڕە، لە سەر داران دەژی و لە لێرەواری دووردەست هێلانە ساز دەکا ☰ جیجاق

**قژبەسەر** / qijbeser/: ناو. *[کنایە]* ژن؛ مێوینەی بنیادەم ☰ زن

**قژبەسەرە** / qijbesere/: ناو. *[کنایە]* جنۆکە؛ وشەیە کە زارۆی پێدەترسێنن ☰ جن

**قژبەڵەکە** / qijbełeke/: ناو. باڵندەیەکە بە قەد سێروو دەبێ، ڕەش و سپییە و لە سەر دار هێلانە دەکا ☰ پرندەای است

**قژپوغ** / qijpuğ/: ئاوەڵناو. چەپەڵ؛ پیس ☰ کثیف

**قژپۆغ** / qijpoğ/: ئاوەڵناو. پیس؛ گڵاو؛ چەپەڵ؛ پۆخڵ ☰ چرکین

**قژدار** / qijdar/: ☜ قژن

**قژز** / qij(i)z/: ناو. قز؛ کچ؛ کەنیشک ☰ دختر؛ دوشیزە

**قژقارە** / qijqaře/: ☜ قشقەڕە ـ١

**قژقژ** / qijqij/: ☜ قژقژاوی

**قژقژاندن** / qijq(i)jandin/: چاوگ. چۆقانی ڕۆن؛ قرچاندنی ڕۆن ☰ گُداختن روغن

**قژقژاوی** / qijq(i)jawî/: ئاوەڵناو. قژقژ؛ قژقژۆکە؛ قژکە؛ پڕ لە لق و پۆپی تێکەڵاو (دار) ☰ با شاخ و برگ انبوه و درهم (درخت)

**قژقژک** / qijq(i)jik/: ☜ قشقەڕە ـ١

**قژقژۆکە** / qijq(i)joke/: ☜ قژقژاوی

**قژقژو** / qijq(i)jû/: ☜ قشقەڕە ـ١

**قژقژە** / qijq(i)je/: ☜ قژگە

**قژقیژۆک** / qijqîjok/: ☜ قشقەڕە ـ١

**قژک** / q(i)jik/: ناو. ١. پەلکی سپی و تورتی بنەوەی کەلەم ٢. ☜ قشقەڕە ـ١ ☰ ١. مغز کلم ٢. ☜ قشقەڕە ـ١

**قژکابەڵەک** / qijkabełek/: ☜ قشقەڕە ـ١

**قژکاڕەش** / qijkařeş/: ☜ قەلەڕەش

**قژکاشەیتانوک** / qijkaşeytanuk/: ☜ قشقەڕە ـ١

**قژکە** / qijke/: ☜ قژقژاوی

**قژگە** / qijge/: ناو. ١. قژقژە؛ قشکە؛ جۆرێ بەری دار مازوو ٢. ☜ قشقەڕە ـ١ ☰ ١. نوعی ثمر مازوج ٢. ☜ قشقەڕە ـ١

**قژگیر** / qijgîr/: ☜ قژگیرە

**قژگیرە** / qijgîre/: ناو. قژگیر؛ کلیپس؛ خشڵێکە ژنان قژی پێ کۆ دەکەنەوە ☰ کلیپس

**قژڵ** / q(i)jił/: ناو. ڕەوتی چۆقین؛ تاوانەوەی ڕۆن لە سەر ئاگر ☰ گُدازش روغن بر آتش

**قژڵان** / qijłan/: چاوگ. قژیلین؛ هەڵچۆقان ☰ گُداختن

**قژڵاندن** / qijłandin/: چاوگ. قژیلاندن؛ چۆقاندن؛ قاڵ کردن ☰ گُداختن

**قژڵە** / qijłe/: ناو. قشرە؛ قشلە؛ سەربازخانە؛ بنکەی چەکداری دەوڵەت لە جێگایەکدا ☰ سربازخانە

**قژمپال** / q(i)jimpal/: ناو. گەمەیەکە لە کوردەواری ☰ نوعی بازی

**قژموک** / qijmûk/: ناو. قەپووشک؛ کاسەی گوڵ؛ ئەو چنگئاسایەی گوڵی لە سەر وێستاوە ☰ کاسەی گُل

**قژن** / q(i)jin/: ئاوەڵناو. *[پلار]* قتد؛ قژنە؛ بە قژ؛ قژدار؛ بە قژی زۆر تێکهاڵاوەوە ☰ با موی سر زیاد و ژولیدە

**قژنگ** / q(i)jing/: ناو. چیگنە؛ چنگنە؛ مێرووبەکە سوور لە قوڕنوو دەکا بە پێستەوە دەچەسپێ ☰ حشرەای کە بە پوست میچسبد

**قژنە** / qijne/: ☜ قژن

**قژنەسەر / qijneser/**: ئاوەڵناو. [پەلار] قژنەسەرە؛ قژن؛ بژن؛ کەفشە ☰ ژولیدەمو

**قژنەسەرە / qijnesere/**: ☜ **قژنەسەر**

**قژۆڵە / q(i)joɫe/**: ☜ **قەلەڕەش**

**قژە[1] / q(i)je/**: ☜ **قژ[1]ـ٢**

▣ **قژە کردن**: توێژ گرتنی ترشاو ☰ کف برآوردن ترشیده

**قژە[2]**: دەنگەناو. چزوبز؛ دەنگی ڕۆنی چۆقاو ☰ جزولز

**قژەسەر / q(i)jeser/**: ناو. مووی درێژی سەر ☰ موی بلند سر

▣ **قژەسەر هاتنەوە**: هاتنەوەی مووی سەر ☰ باز روییدن موی سر

**قژەکردگ / q(i)jekirdig/**: ئاوەڵناو. ترشاوی توێژی ترشان لە سەر ☰ تُرشیدەی کف برآوردە

**قژیاک / qijyak/**: ☜ **قەلەڕەش**

**قژیاگ / qijyag/**: ☜ **قالاو**

**قژیک / q(i)jîk/**: ☜ **قشقەرە ـ١**

**قژیلاندن / q(i)jîlandin/**: چاوگ. ١. پێسەلماندن؛ چەسپاندن ٢. ☜ **قژلاندن** ☰ ١. ثابت کردن ٢. ☜ **قژلاندن**

**قژیلین / q(i)jîlîn/**: ☜ **قژلان**

**قژین / q(i)jîn/**: چاوگ. ١. زیرەزیرکردن؛ زەنا ـ زەنا کردن ٢. خەفەتبار بوون ☰ ١. جیغ و داد کردن ٢. اندوهگین بودن

**قسپ / qisp/**: ناو. ١. بەڵا؛ تەگەرە ٢. ☜ **قیسپ** ☰ ١. آسیب ٢. ☜ **قیسپ**

**قست / qist/**: ☜ **قیست ـ٢**

**قستی / qistî/**: ☜ **قیستی**

**قسر[1] / qis(i)r/**: ☜ **قسڵ**

**قسر[2]**: ئاوەڵناو. قرد: ١. نەزۆک؛ ئەستێور ٢. لەبەرکەوتوو ☰ ١. سترون ٢. از ثمر افتاده

**قسری / qisrî/**: ☜ **قسڵی**

**قسقل / qisqil/**: ناو. تسقل؛ تسکل؛ قسکل؛ بەرێکی دار مازووە ☰ از ثمرهای مازوج

**قسقە[1] / qisqe/**: ناو. ١. پیاز لە تەمەنێکی دیاریکراودا ٢. تووی پیاز ☰ ١. ساقەی نورسیدەی پیاز ٢. بذر پیاز

**قسقە[2]**: ئاوەڵناو. تازە پێگەییو (بۆ پیاز) ☰ نورس (پیاز)

**قسقەپیاز / qisqep(i)yaz/**: ناو. پیازی تازە پێگەییو ☰ پیاز تازە رسیدە

**قسقەوان / qisqewan/**: ناو. وەنەتەق؛ قەزوان؛ قەزقەوان ☰ چاتلانقوش

**قسکل / qiskil/**: ناو. گزگل؛ جۆرێ بەری دارمازوو ☰ نوعی ثمر مازوج

**قسڵ / qisɫ/**: ناو. قسر؛ کسڵ؛ کلس؛ ئاهەک ☰ آهک

**قسڵاو / qisɫaw/**: ناو. ئاهەکی دە ئاوکراو ☰ آب‌آهک

**قسڵی / qisɫî/**: ئاوەڵناو. قسری؛ ئاهەکی ☰ آهکی

**قسم / qism/**: ناو. جۆر؛ چەشن ☰ نوع؛ قِسم

**قسمەت / qismet/**: ناو. چارەنووس؛ بەخت و هات ☰ سرنوشت

**قسن / qis(i)n/**: ناو. ١. شەخس؛ زیارەتگا ‹قسنی پیاوچاکان› ٢. دیواری بە جەغز لە بەرد ‹دیان کاتێ گەینە قسنی بەر شار/ لاشێکی تخێل لە بەینی دوو دار «هەژار، *مەم و زین*»› ٣. ☜ **قیست ـ٢** ☰ ١. مزار ٢. دیوار سنگچین مدور ٣. ☜ **قیست ـ٢**

**قسناخ / qisnax/**: ناو. قاسناخ؛ قاسناغ؛ قسناغ؛ قەسناخ؛ قەسناغ؛ قەسناغە؛ پێوانەیەکی خەڵە بەرانبەر بە سیودوو کیلۆ ‹قەت لە یەک قسناخ کەمی جۆ نادەمێ، هێشتا لەڕە/ ساڵ دوانزەی مانگ سواری نابم و هەر ماندووە! «شێخ ڕەزا»› ☰ پیمانەای برای غلە برابر سی‌ودو کیلو

**قسناغ / qisnağ/**: ☜ **قسناخ**

**قسنی**[1] / qisnî /: ناو. قەسنی؛ بۆنخۆشێکی ڕەشە لە شەم دەکا ☰ موم مانندی سیاه و خوشبو

**قسنی**[2]: ناوەڵناو. قیستی؛ پاژ ـ پاژ ☰ قسطی

**قسور** / q(i)sûr /: ناو. قوسوور؛ کۆتایی؛ درێخی؛ کاسوولی ☰ قُصور

**قسە** / q(i)se /: ناو. قسیە؛ قەسە؛ قەسیە: ١. پەیڤ؛ کار و ڕەوتی ئاخافتن ‹کەس قسەی نەکرد› ٢. نیاز؛ مەبەست ‹باشە قسەی تۆ چییە؟› ٣. وتە؛ گوتە؛ واتە ‹قسەیەکی بەرێوجێ، بە شەنگەداری دەشبهێ ... «هەژار، *قورئان*»› ٤. کاری تۆژینەوە؛ کۆڵینەوە ‹با دانیشین جوان لە سەری قسە بکەین، ئەوجار بڕیار بدەین› ☰ ١. سخن؛ حرف ٢. حرف؛ مقصود ٣. گفتار ۴. گفتگو

⊡ **قسەی ئاگردان**: قسەی دوور لە ڕاستی و کردەوە ‹قسەی ئاگردان، فشەی شاگردان! «مەسەل»› ☰ سخن دور از واقع

**قسەی پێشینیان**: پەندی پێشینان ☰ پند گذشتگان

**قسەی حیسابی**: قسەی جوان و بەرێوجێ ☰ حرف حساب

**قسەی خۆش**: واتەی جوان و لەبەردڵان ☰ کلام شیرین

**قسەی خۆمانە**: وتوێژی دۆستانە و ناوخۆیی ☰ گفتگوی خصوصی

**قسەی سارد/ سەرد**: */مەجاز/* قسەی ناخۆش و نابەدڵ ‹لە پاداشی قسەی سەردا هەمە ئاه و هەناسەی گەرم/ کەسێ شێتانە بەردم تێ گرێ من بەرقی تێ دەگرم «مەحوی»› ☰ سخن سخت

**قسەی سوک**: قسەی ناخۆش؛ جنێو ☰ دُشنام

**قسەی شەو**: ئەو خەیاڵ و ڕاوێژەی شەو لە سەر دەدا و بە ڕۆژ لە بیر دەچێتەوە ☰ خواب و خیال

**قسەی قۆڕ**: قسەی مفت؛ تورەهات؛ قسەی بێواتا ☰ حرف مُفت

**قسەی قەڵەمی**: ١. قسەی کتێوی؛ جۆرێ قسە کردن چما نووسراوە دەخوێنییەوە ٢. */کینایە/* قسەی هەژدە ـ هەژدە؛ قسەی زل ـ زل بۆ خۆ نیشان دان ☰ ١. لفظ قلم ٢. حرفهای گنده ـ گنده

**قسەی کتێوی**: ☜ قسەی قەڵەمی ـ١

**قسەی مفت**: ☜ قسەی قۆڕ

**قسەی نەستەق**: قسەی پڕ لە ئامۆژگاری ☰ سخن آموزنده

**قسەی هەژدە ـ هەژدە**: ☜ قسەی قەڵەمی ـ٢

⊡ **قسە بردن**: ☜ قسە هێنان و بردن

**قسە بڕینەوە**: قسە یەکلایی کردنەوە؛ مەبەست گوتن و کۆتایی هێنان بە قسە ☰ حرف آخر را زدن

**قسە بزرکاندن**: */مەجاز/* وڕدان؛ قسە بە نەکولاوی کردن ☰ ژاژخاییدن

**قسە بە دەم کەسێکەوە نان**: */کینایە/* قسەیەک بە ناوی کەسێکەوە چەسپاندن ☰ سخنی را بە کسی نسبت دادن

**قسە بە شەکر بڕینەوە**: */کینایە/* بە ڕێزەوە، قسەی کەسێک بڕین ☰ محترمانه سخن کسی را قطع کردن

**قسە پەڕاندن**: ١. */پلار/* ڕاواندن؛ وڕاوە کردن ٢. بە بێ بیرکردنەوە قسە کردن ☰ ١. هذیان گفتن ٢. دهن‌لقی کردن

**قسە پێ بڕین**: دانە ناو باڵ قسەدا؛ قسەی کەسێ قەت کردن ☰ توی حرف کسی دویدن

**قسە پێ بوون**: ١. هەبوونی بڕوا یا بیرۆکەیەک لەمەڕ بابەتێکەوە ‹لەم بارەوە منیش قسەم پێیە› ٢. بەزانست و ئاگا بوون لە مەبەستێ ☰ ١. حرفی برای گفتن داشتن ٢. مُطلع بودن

**قسە پێ کردن/ گوتن/ وتن**: */مەجاز/* ١. جوێن پێ دان ‹هەتیوە لە هیچ و خۆڕایی زۆرێ قسەی پێ

کردین!› ۲. کەسێ سەرکۆنە کردن ☰ ۱. کسی را دشنام دادن ۲. کسی را سرزنش کردن

**قسه پێ نەهێشتن:** هەموو ڕێگایەکی قسه کردن لە کەسێ گرتن ☰ در مجادلە بە بن‌بست کشاندن

**قسه تێدا نەبون:** *[مەجاز]* قسه نەبوون؛ بێ‌عەیب بوون ☰ حرف نداشتن

**قسه جاوین:** *[مەجاز]* بە تێفکرین و ڕامانەوە قسە کردن ☰ از روی فکر و حساب شده حرف زدن

**قسه جاوینەوە:** *[مەجاز]* ۱. ڕینگەڕینگ کردن؛ چەندپاتە کردنەوەی قسەیەک ۲. جوان و پاراو قسه نەکردن ☰ ۱. سخنی را چندباره گفتن ۲. گُنگ و نافصیح سخن گفتن

**قسه خواردنەوە:** *[مەجاز]* قسە قووت دان: ۱. پەژیوان بوونەوە لە ئاخافتنی خۆ ۲. قسە نەکردن یان بە نیوەچڵی دانان یان بە چەشنێ جگە لە مەبەستی خۆ درێژە دان ☰ ۱. از حرف خود برگشتن ۲. حرف خود را خوردن

**قسه دابڕین:** *[کینایە]* دەنگ گۆڕین؛ بە ئاڵۆزی قسەی خۆ بڕین ☰ حرف خود را بە حالت قهر، ناتمام گذاشتن

**قسه درکاندن:** ئاشکرا کردنی نهێنی ☰ فاش کردن

**قسه دۆڕاندن:** *[کینایە]* ۱. درکاندن؛ دەرخستن ۲. بێ‌فایدە چوونی قسە ☰ ۱. فاش کردن ۲. هرز رفتن سُخن

**قسه دەراوردن:** ☜ **قسه دەرهێنان**

**قسه دەرکێشان:** نهێنی پێ درکاندن ☰ حرف از زیر زبان کشیدن

**قسه دەرهاوردن:** ☜ **قسه دەرهێنان**

**قسه دەرهێنان:** قسە دەراوردن؛ قسە دەرهاوردن: ۱. قسە بۆ هەڵبەستن ۲. قسە دەرکێشان؛ پێ درکاندن ☰ ۱. دروغ بافتن ۲. حرف از زیر زبان کشیدن

**قسه ڕاکێشان:** *[مەجاز]* قسە دەرکێشان؛ پێ درکاندنی نهێنی ☰ حرف از زیر زبان کشیدن

**قسه ڕاواندن:** ڕاواندن؛ وڕاوە کردن ☰ هذیان گفتن

**قسه زڕاندن:** *[کینایە]* بڵاو کردنەوەی قسە و باسی نهێنی ☰ افشا کردن راز و سخن

**قسه سوار بون:** *[مەجاز]* قسە لە سەرووی قسەی دیترانەوە بوون (بە هۆی پێ بوونی بەڵگەی جێ‌بڕواوە، یاخۆ دەسەڵاتی زیاترەوە) ☰ حرف (کسی) چربیدن

**قسه، قسەی کەسێک بون:** قسەی کەسێک سوار بوون ‹لە ماڵی ئێمە قسە، قسەی بابمە› ☰ حرف، حرف کسی بودن

**قسه قوت دان:** ☜ **قسه خواردنەوە**

**قسه کردن:** ۱. گوتن؛ وتن؛ ئاخافتن ‹قسە بکە بۆم، بزانم چ باس بوو؟› ۲. (لێ) دوان ‹لە بارەی چییەوە دەتەوێ قسە بکەی؟› ۳. وتار دان ‹لە سەرەتای کۆڕەکەوە، سەرۆکی زانستگا قسەی کرد› ٤. *[پلار]* وڕ لێ ڕان دان ‹باوڕی پێ مەکە! قسە ئەکا، چت وا چۆن ئەوێ؟› ☰ ۱. **گفتن**؛ حرف زدن ۲. سخن گفتن ۳. سخنرانی کردن ۴. حرف مُفت زدن

**قسه کردنەوە:** گێڕانەوە؛ گوتنەوە ‹ئەمانە وتم، نەچی قسە کەیتەوە بۆ بابم› ☰ بازگو کردن

**قسه کولاندن:** *[مەجاز]* بیر لێ کردنەوە و قسە کردن ☰ فکر کردن و حرف زدن

**قسه گرتنە دڵ:** *[مەجاز]* لە قسەی کەسێک ڕەنجان ☰ حرف کسی را بە دل گرفتن

**قسه گنخاندن:** ☜ **قسەی خۆ قوت دانەوە**

**قسه گۆڕان:** ۱. بابەتی قسە بەرەو لایەکی تر بردن ۲. مانای پەیڤی کەسێ کەم و زیاد و ئەملا و ئەولا پێ کردن ☰ ۱. حرف را عوض

کردن ۲. حرف کسی را وارونه تفسیر کردن

**قسه لە خۆوە دەرهێنان:** قسە هەڵبەستن ⊒ حرف از خود درآوردن

**قسه لە دەم دەرپەڕین:** *[مەجاز]* قسە لە دەم داکەوتن ⊒ حرف از دهان افتادن

**قسه لە دەم کەسێک قۆستنەوە:** *[مەجاز]* قسەی کەسێک لە بەرژەوەندی خۆ، گرتنە دەستەوە ⊒ از سخن کسی به نفع خود استفاده کردن

**قسه لە سەر داکێشان:** ☜ **قسه لێدەرکێشان**

**قسه لە سەر کەس/ شتێک بون:** ۱. سەبارەت بە کەس/ شتێک قسەوباس هەبوون ‹قسە لە سەر مانەوەی سەرۆکە› ۲. *[مەجاز]* عەیب لە کەس/ شتێکدا بوون ‹ئەو باسە قسەی زۆری لە سەرە› ⊒ ۱. سخن در بارەی کسی/ چیزی بودن ۲. جای سؤال در کس/ چیزی بودن

**قسه لە قسەدا کردن:** پەڕینە ناو قسەی کەسێ کە داخێوێ ⊒ وسط حرف کسی دویدن

**قسه لێ دەرکێشان:** سەر داکێشان؛ قسە لێ دەرهێنان؛ قسە لە سەر داکێشان؛ قسە لێڕاکێشان؛ ڕاستی پێدەرکاندن ⊒ حرف از زیر زبان کسی کشیدن

**قسه لێ دەرهێنان:** ☜ **قسه لێدەرکێشان**

**قسه لێ ڕاکێشان:** ☜ **قسه لێدەرکێشان**

**قسه لێ زانین:** بیر و ڕای کەسێ بیستن ‹جارێ بچۆ قسەیەکی لێ بزانە، دڵنیا بە مێردت پێ دەکا، ئەمجار بڕۆ بۆ خوازبێنی!› ⊒ دانستن رأی و نظر کسی

**قسه لێ کردن:** باس کردنی شتێ؛ لە مەڕ شتێکەوە قسە کردن ⊒ دربارەی موضوعی گفتگو کردن

**قسه نەبون:** ۱. قار بوون ۲. ڕازی بوون ۳. ☜ **قسه تێدا نەبون** ⊒ ۱. قهر بودن ۲. راضی بودن ۳. ☜ **قسه تێدا نەبون**

**قسه وتن:** *[کینایە]* جوێن/ جنێو دان ⊒ دشنام دادن

**قسه وەرگرتن:** *[کینایە]* گوێ دان و تێگەیشتن ⊒ سخنی را شنیدن و فهمیدن

**قسه هەڵبەستن:** *[کینایە]* بوختان کردن ⊒ بُهتان زدن

**قسه هەڵچنین:** *[کینایە]* زمانشڕی کردن؛ قسە بردن؛ دووزمانی کردن ⊒ سخنچینی کردن

**قسه هێنان:** ☜ **قسه هێنان و بردن**

**قسه هێنان و بردن:** قسە هێنان؛ قسە بردن؛ شووفاری کردن ⊒ سخنچینی کردن

**قسەی حەق ڕەق بون:** قسەی ڕاست تاڵ بوون ⊒ حرف راست تلخ بودن

**قسەی خۆ بردنە سەر:** *[کینایە]* ۱. کاری خۆ کردن؛ خواستی خۆ جێبەجێ کردن ۲. لە سەر قسەی خۆ وەستان ⊒ ۱. خواستەی خود را عملی کردن ۲. سر حرف خود بودن

**قسەی خۆ بردنە بان گا:** *[مەجاز]* قسەی خۆ سەلماندن ⊒ حرف خود را به کرسی نشاندن

**قسەی خۆ قوت دانەوە:** *[کینایە]* قسە گنخاندن؛ قسەی خۆ خواردنەوە ⊒ حرف خود را خوردن

**قسەی خۆ کردن:** مرازی خۆ دەربڕین ⊒ حرف خود را زدن

**قسەی خۆ کردنە یەک:** لە سەر قسەیەک پێکهاتن ⊒ حرف خود را یکی کردن

**قسەی خۆمان بون:** *[کینایە]* لە بەین خۆماندا مان ‹قسەی خۆمان بێ کارێکت پێ نەکرا› ⊒ بین خودمان بودن

**قسەی دڵی کەسێک کردن:** بەرامبەر بە ئارەزووی کەسێک پەیڤین ⊒ حرف دل کسی را زدن

**قسەی زل کردن:** *[کینایە]* قسەی گەورەتر لە ئاستی کەسایەتی خۆ کردن ⊒ حرف بزرگتر از دهن خود زدن

**قسەی شت/ کەسێک کردن:** سەبارەت بە شت/ کەسێک پەیڤین ☰ حرف چیزی/ کسی را زدن

**قسەی شتێک/ کەسێک داهێنان:** باسی شتێک/ کەسێک هێنانە پێش ☰ حرف چیزی/ کسی را پیش کشیدن

**قسەی کەسێ بڕ کردن:** ☜ **قسەی کەسێ ڕۆیشتن**

**قسەی کەسێ بڕین:** بڕ بە پەیڤینی کەسێ دان ☰ حرف کسی را بُریدن

**قسەی کەسێ بەبرەو بوون:** ☜ **قسەی کەسێ ڕۆیشتن**

**قسەی کەسێ ڕۆیشتن:** *[کینایە]* قسە کەسێ بڕ کردن/ بەبرەو بوون؛ وەرگرتنی قسەی کەسێک لە لایەن کەسانی دیکەوە ☰ حرف کسی طرفدار داشتن

**قسەی کەسێ شکاندن:** *[کینایە]* بە قسەی کەسێ نەکردن؛ تکای کەسێ وەرنەگرتن ☰ حرف کسی را زمین زدن

**قسەی کەسێ شل بوون:** *[کینایە]* ١. وەرامی نەرێنی پێ بوون ٢. شتێ بە دڵ نەبوون ٣. دڵنیا نەبوون ☰ ١. جواب منفی داشتن ٢. مایل نبودن ٣. مطمئن نبودن

**قسەی کەسێک کێشانە سەر خۆ:** *[کینایە]* قسەی کەسێک بردنە سەر خۆ؛ خۆ بە بابەتی قسەی کەسێک زانین ☰ حرف کسی را بە خود گرفتن

**قسەی کەسێک لە بەرد دان:** ☜ **قسەی کەسێک نانە ژێر پا**

**قسەی کەسێک نانە ژێر پێ:** *[مەجاز]* قسەی کەسێک لە بەرد دان؛ بە گوێی کەسێک نەکردن ☰ حرف کسی را (بە) زمین انداختن

**قسەی کەسێک یەکێ بوون** وتەی خۆ نەگۆڕان ☰ حرف کسی یکی بودن

**بە قسەی کەسێ کردن:** بە گوێ/ قەوڵ کەسێ کردن؛ قسەی کەسێ گرتنە گوێ ☰ حرف کسی را گوش دادن

**سەری قسە کردنەوە:** *[کینایە]* باسێ دەستپێکردن؛ سەری باسێ کردنەوە ☰ سر صحبت را باز کردن

**لە سەر قسەی خۆ بوون/ وەستان:** لە قسەی خۆ پاشەکشێ نەکردن ☰ سر حرف خود بودن

**هاتنە قسە:** دەم باز کردن؛ دەس کردن بە قسە ☰ بە حرف آمدن

**هێنانە قسە:** دواندن؛ قسە پێ کردن ☰ بە حرف آوردن

**قسەبەر** / q(i)seber/: ناو. شووفار؛ دووزمان ☰ سخن‌چین

**قسەبێژ** / q(i)sebêj/: ☜ **قسەکەر**

**قسەپتەو** / q(i)sep(i)tew/: ئاوەڵناو. قسەدروست؛ خاوەن‌بەڵێن ☰ قول‌دُرُست

**قسەپەڕێن** / q(i)sepeřên/: ئاوەڵناو. *[پلار]* زارشڕ؛ تێدانەوەستاو ☰ دهن‌لق

**قسەپەڕێنی** / q(i)sepeřênî/: ناو. لافە؛ ڕاوە؛ وڕاوە ☰ هذیان

**قسەتاڵ** / q(i)setał/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* زمان‌تاڵ؛ قسەناخۆش ☰ تلخ‌زبان

**قسەتڕن** / q(i)set(i)řin/: ئاوەڵناو. *[پلار]* قسەی پیس و بێ‌جێ‌کەر ☰ بدزبان

**قسەجوان** / q(i)sec(i)wan/: ئاوەڵناو. گۆپاک ☰ نیکوسخن

**قسەخوش** / q(i)sex(i)weş/: ☜ **قسەخۆش**

**قسەخۆش** / q(i)sexoş/: ئاوەڵناو. قسەخوەش؛ زمان‌شیرین ☰ خوش‌گفتار

**قسەدروست** / q(i)sed(i)rust/: ئاوەڵناو. خاوەن‌بەڵێن ☰ درست پیمان

**قسەدرێژ** / q(i)sed(i)rêj/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* بەجووج؛ چەنەباز؛ زۆربلێ؛ فرەوێژ ☰ ژاژخا؛ وراج

**قسەڕاست** / q(i)seřast/: ئاوەڵناو. درۆنەکەر؛

ڕاستبێژ ■ راستگو

**قسەڕاگوێز / q(i)seřag(i)wêz/**: ناو. خەبەرگوهێز ■ سخن‌چین

**قسەڕووت / q(i)seřût/**: ناوەڵناو. *[مەجاز]* زمانڕووت؛ خاوەن قسەی ئاشکرا و بێ مەرایی ■ رُک؛ صریح‌الهجه

**قسەڕەپوڕاست / q(i)se řep û řast/**: ناوەڵناو. *[مەجاز]* قسەڕەق ■ رُک‌گو

**قسەڕەق / q(i)seřeq/**: ناوەڵناو. *[مەجاز]* ڕەپوڕاست قسەبێژ ■ رُک‌گو

**قسەڕەنگین / q(i)seřengîn/**: ناوەڵناو. *[مەجاز]* بەدەمودوو؛ خۆش‌ڕاوێژ ■ سُخندان

**قسەڕەوا / q(i)seřewa/**: ناوەڵناو. تایبەتمەندی کەسێ کە بە قسەی دەکرێ ■ ویژگی کسی که سخنش خریدار دارد

**قسەڕەوان / q(i)seřewan/**: ناوەڵناو. ڕەوانبێژ؛ دەمپاراو ■ خوش‌سخن

**قسەزان / q(i)sezan/**: ناوەڵناو. زمانپاراو ■ سخندان

**قسەزل / q(i)sezil/**: ناوەڵناو. *[کینایە]* ١. بە بافیش ٢. تایبەتمەندی کەسێ کە قسەی لە خۆ گەورەتر و بە توێکڵ دەکا ■ ١. گُنده‌گو ٢. ویژگی کسی که سخنانش فراتر از انتظار است

**قسەسارد / q(i)sesard/**: ناوەڵناو. *[مەجاز]* پەیڤ‌ناخۆش؛ بەرانبەر بە قسەخۆش ■ سردگفتار

**قسەسەیر / q(i)seseyr/**: ناوەڵناو. نوکتەباز؛ حەنەکچی گاڵتەچی؛ قسەخۆش ■ بذله‌گو

**قسەشووم / q(i)seşûm/**: ناوەڵناو. *[مەجاز]* دەمڕەش ■ شوم‌گفتار

**قسەشیرین / q(i)seşîrîn/**: ناوەڵناو. *[مەجاز]* شەکرشکێن؛ شەکرلێو؛ قسەخۆش ■ شیرین‌سخن

**قسەقوت / q(i)sequt/**: ناوەڵناو. *[مەجاز]* تایبەتمەندی کەسێ کە قسەی سەیر و بەتوێکڵ دەکا ■ نُکته‌سنج

**قسەکەر / q(i)seker/**: ناو. بێژەر؛ وێژەر؛ وتەبێژ؛ وتەوات؛ قسەبێژ؛ قسەکەر ■ سخنگو

**قسەگێڕەوە / q(i)segêřewe/**: ناوەڵناو. تیانەوەستاو؛ زمانشڕ ■ دهن‌لق

**قسەلەڕوو / q(i)seleřû/**: ناوەڵناو. تایبەتمەندی کەسێ ڕەپ و ڕاست قسە دەکا ■ رُک‌گو؛ صریح‌اللهجه

**قسەلۆک / q(i)sełok/**: ناو. *[مەجاز]* قسەی سووک و ناونیتکە ■ حرف زشت و ناروا

**قسەمێچکە / q(i)semêçke/**: ناوەڵناو. *[مەجاز]* ١. مەرایی‌کەر؛ دووزوان ٢. دەمخاو؛ تایبەتمەندی پیاوێک کە وەک ژنان قسە دەکا ■ ١. ریاکار ٢. ویژگی مردی که زنانه سخن می‌گوید

**قسەناخۆش / q(i)senaxoş/**: ☜ **قسەتاڵ**

**قسەناس / q(i)senas/**: ناوەڵناو. تێگەیشتوو؛ زانا ■ فهمیده

**قسەنەبیس / q(i)senebîs/**: ناوەڵناو. *[کینایە]* گوێ هشک ■ حرف نشنو

**قسەنەزان / q(i)senezan/**: ناوەڵناو. *[کینایە]* بێدەموپل؛ دەمپووچ؛ دەمچەوت؛ دەمسارد ■ بی‌زبان

**قسەنەستەق / q(i)senesteq/**: ناوەڵناو. تایبەتمەندی کەسێ قسەی پڕکاکڵ و زانایانە دەکا ■ نغزگوی

**قسەوباس / q(i)se w bas/**: ناو. ١. هەواڵ؛ دەنگوباس ٢. هەرچی قسەی وا بۆ کردن بشێ ‹دانیشن قسەوباسی خۆتان بکەن!› ■ ١. خبر ٢. حرف‌های گفتنی

**قسەهەڵبەست / q(i)sehełbest/**: ناوەڵناو. بوختانکەر ■ بُهتان‌زن

**قسەهەڵچن / q(i)sehełçin/**: ناوەڵناو. *[کینایە]* دووزمان؛ دووزوان؛ شووفار ■ سخن‌چین

**قسیه** / qisye/: ☜ **قسه**

**قسیه‌که‌ر** / qisyeker/: ناو. بوێژ؛ گوته‌بێژ ☰ گوینده

**قش** / qiş/: ناو. گاشه‌به‌ردی زل له‌ چیادا ☰ صخره‌ی بزرگ در کوه

**قشپل** / qişpil/: ناو. کشپل؛ بشکول؛ پشکه‌ڵ ☰ پشکل

**قشپیلانه** / qişpîlane/: ☜ **قشتیلانه**

**قشت**[١] / qişt/: ناو. په‌رچووکه‌ی بان توێڵ ☰ موی پیشانی

**قشت**[٢]: ☜ **قشتیلانه**

**قشتوقۆڵ** / qişt û qoł/: ☜ **قشتیلانه**

**قشتیلانه** / qiştîlane/: ناوه‌ڵناو. قشت؛ قشپیلانه؛ قشت‌وقۆڵ؛ خونچیلانه؛ جوانکیله ☰ کوچولوی دوست‌داشتنی

**قشخه‌ڵه** / qişxełe/: ☜ **قشقه‌ڕه ـ١**

**قشره** / qişre/: ☜ **قژڵه**

**قشغره** / qişğ(i)re/: ☜ **قشقه‌ڕه ـ١**

**قشقاڕه** / qişqaře/: ☜ **قشقه‌ڕه ـ١**

**قشقره** / qişq(i)re/: ☜ **قشقه‌ڕه**

**قشقونه** / qişqune/: ناو. پاڵووی زین ☰ پاردُم زین

**قشقه‌ڕه** / qişqeře/: ناو. ١. قشقره؛ قشقه‌ڵه؛ قشقاڕه؛ قشکه‌ڵه؛ قشخه‌ڵه؛ قشغره؛ قه‌شقه‌ڵ؛ قشقه‌ڵ؛ قه‌لقشک؛ قه‌لقیشک؛ قشێڕه؛ که‌شکه‌ره؛ قژقژک؛ قژقژوو؛ قژقیژوک؛ قژک؛ قژکابه‌له‌ک؛ قژکاشه‌یتانوک؛ قژگه؛ قژیک؛ قلاژیله؛ قوله‌بازه‌له؛ قالاوبازه‌ڵه؛ قه‌ره‌باچکه؛ قه‌ژقه‌ژک؛ قه‌لانجه؛ قه‌لانچه؛ قه‌له‌باچکه؛ قه‌له‌بانه‌یی؛ قالاوه‌بووڵینه؛ قه‌له‌بازه‌له؛ قه‌له‌ژاژه؛ قه‌له‌ژاره؛ قه‌له‌ژاله؛ په‌له‌ژاره؛ خه‌زال؛ ڕه‌قشێلک؛ غه‌لابازه‌ڵه؛ غه‌له‌بازڵه؛ کلک‌گه‌زه؛ گه‌زبه‌تنه؛ کلک‌درێژ؛ قژقاڕه؛ قوره‌باچکه؛ قرک؛ زاخێ؛ دوف‌مه‌ساسه؛ قلاجگ؛ په‌له‌وه‌رێ له‌ تیره‌ی قه‌لان، به‌ جه‌سته‌ی گچکه و ڕه‌نگی ڕه‌ش ـ شینی په‌رداخه‌وه که‌ نێر و مێی وه‌ک یه‌ک وایه ٢. هه‌راوهوریا؛ زه‌نا ـ زه‌نا ☰ ١. زاغی ٢. قشقرق

**قشقه‌ڕه‌سووره** / qişqeřesûre/: ناو. باڵنده‌یه‌که له‌ تیره‌ی قه‌ل، له‌ قشقه‌ڕه‌ بچووکتر، به‌ په‌ڕ و باڵی زه‌ردیله‌، خاڵی ڕه‌شی بچووک له‌ نێو چاواندا و کلکی ڕه‌ش، له‌ په‌پووسێمانه و چوره‌ ده‌چێ. له‌ ده‌شتی خیزه‌ڵان و نێو پنچان ده‌ژی ☰ زاغ بور

**قشقه‌ڕه‌ق** / qişqeřeq/: ☜ **قشقه‌ڕه ـ١**

**قشقه‌ڵ** / qişqeł/: ☜ **قشقه‌ڕه ـ١**

**قشقه‌ڵه** / qişqełe/: ☜ **قشقه‌ڕه ـ١**

**قشکه** / qişke/: ☜ **قژگه ـ١**

**قشکه‌ڵه** / qişkełe/: ☜ **قشقه‌ڕه ـ١**

**قشلک** / qişlik/: ناو. گیایه‌که وه‌ک ئالقه‌تیز ده‌چێ ☰ گیاهی است

**قشلاخ** / qişłax/: ناو. قشلاغ؛ قشلاق: ١. زستانه‌وار ٢. دێی دابڕاو له‌ دێی گه‌وره ☰ ١. قشلاق ٢. دهکده‌ی جدا شده از ده بزرگ

**قشلاغ** / qişłağ/: ☜ **قشلاخ**

**قشلاق** / qişłaq/: ☜ **قشلاخ**

**قشڵه** / qişłe/: ☜ **قژڵه**

**قشێڕه** / q(i)şêře/: ☜ **قشقه‌ڕه ـ١**

**قغ** / qiğ/: ده‌نگ. ئای؛ ئیش ‹فجووق له‌ داڵی چاوزه‌ق/ قغ له‌ ڕاوکه‌ری دڵڕه‌ق «گۆران»› ☰ کلمه‌ی بیان بیزاری

**قف** / qif/: ناو. کۆخه؛ کۆکه؛ قۆزه ☰ سُرفه

**قفای** / q(i)fay/: چاوگ. کۆخین؛ قۆزین ☰ سُرفه کردن

**قفک** / qifk/: ناو. زه‌نبیله‌ی زل؛ سه‌به‌ته‌ی له‌ پووشی به‌ده‌سک ☰ زنبیل بزرگ دسته‌دار

**قفڵ** / qifł/: ناو. قوفل؛ قوفڵ؛ قولف؛ قلف؛ گۆله؛ کۆد؛ کۆج؛ ڕیچ؛ که‌سه‌ک؛ قاسه؛ چفت؛ چیلان؛ کلۆن (دارینه)؛ کلێله؛ کیلۆن؛ کولۆم؛ کێلوون؛ کلیت؛ کلیل؛ ئامرازێک بۆ داخستنی شتێک و

بەرگری لە دەست پێگەیشتنی دیتران ☰ قُفل
⊡ **قفڵ دان:** داخستن بە قفڵ ☰ قُفل زدن
**قفڵ دران:** داخران بە قفڵ ☰ قفل شدن
**قفڵ کردن:** قفڵ لێدان؛ قفڵ دان ☰ قُفل کردن
**قفڵ لێدان:** ☜ **قفڵ کردن**

**قفڵبەند** / qifłbend/: ناو. جۆرێ چنینی خشت و بەرد لە دیوارچنیندا ☰ قُفلبند

**قفڵدراو** / qifłd(i)raw/: ناوەڵناو. قفڵ لێدراو؛ بە قفڵ داخراو ☰ قُفل شده

**قفڵساز** / qifłsaz/: ناو. قوڵفساز؛ کلیلساز ☰ قفل‌ساز

**قفڵکراو** / qifłk(i)raw/: ناوەڵناو. داخراو؛ بەسراو؛ پێوەدراو ☰ بسته

**قفڵلێدراو** / qifłlêd(i)raw/: ☜ **قفڵدراو**

**قفە** / q(i)fe/: ناو. کۆخە؛ قوفە؛ قۆخە؛ قۆزە ☰ سُرفه

**قفەڕەشە** / q(i)feřeşe/: ☜ **قۆزەڕەشە**

**قفین** / q(i)fîn/: چاوگ. قوفین؛ کۆخین؛ کۆکین؛ قۆزین ☰ سُرفه کردن

**قل** / qil/: ناو. ١. چڵ؛ تاقە لاسکێک ٢. دەنک؛ دەنکە؛ تاقەدانە ٣. ناو لەپ؛ ناو مشت ‹بیخە قلمەوە!› ٤. خۆڵەمێش؛ بووڵ ☰ ١. یک ساقه ٢. حبّه ٣. کف دست ۴. خاکستر

**قلاپیک** / q(i)lapîk/: ناو. ١. بەدەن؛ قالب؛ لەش ٢. قەلپووت؛ قەلپوۆچ؛ کاسەچاوی بەتاڵ ☰ ١. کالبد ٢. حدقەی خالی از کُرەی چشم

**قلاچە** / q(i)laçe/: ☜ **قالاو**

**قلاژیلە** / q(i)lajîle/: ☜ **قالاو**

**قلاژیڵە** / q(i)lajîłe/: ☜ **قشقەڕە ـ١**

**قلاشتن** / q(i)laştin/: ☜ **قەڵشاندن**

**قلانەقریوە** / q(i)laneq(i)rîwe/: ناو. کار و ڕەوتی هەڵاتن و باڕاندن و کایە کردنی بەرغەل و کاژیلە لە کاتی نزیک بوونەوە لە کانی و لەوەڕ ☰ بازی برّه و بُزغاله هنگام نزدیک شدن به آب و علف

**قلانیشۆ** / q(i)lanîşo/: ☜ **قەلاندۆش**

**قلپیک** / qilpik/: ☜ **قرقێنە**

**قلپەنجە** / qilpence/: ناو. پەنجە لە ناو پەنجە ☰ پنجه در پنجه

**قلچک** / qilçik/: ناو. ١. پیشگان؛ ئامرازی کنگر و بنەگیا دەرێنان ٢. قوڵی کەوا ٣. قونچکی مێوژ و ترێ ٤. داسوو؛ قەلاس؛ پرزەگوڵی گەنم و جۆ ٥. چرنووکی چۆلەکە و مەلی پچووک ☰ ١. بیلچەی باغبانی ٢. آستین قبا ٣. دُنبالچەی مویز و انگور ۴. اخگل؛ سیخچە ۵. چنگال پرندگان کوچک
⊡ **قلچک کردن:** ١. قونچک لێ کردنەوە ٢. تەقڵە بە چۆلەکە کردن لە جەنگەی زەماوند و دەهۆڵ و زوڕنا لێداندا ☰ ١. برداشتن دُنبالچەی مویز و انگور ٢. به هوا پراندن گنجشک هنگام عروسی

**قلخان** / qilxan/: ناو. دڕکێکە بۆ سووتەمەنی بە کار دێ ☰ خاری که مصرف سوخت دارد

**قلف** / qilf/: ☜ **قولب[1]ـ٢**

**قلقک** / qilqik/: ناو. ١. کرۆژە؛ قرقرتۆک؛ کرۆچەنە ٢. شمشێرەی درگا ☰ ١. غضروف ٢. کلید کلون چوبی در

**قلقل[1]** / qilqil/: ناو. بەری گیایەکە لە نیسک دەکا ☰ ثمر گیاهی عدس مانند

**قل ـ قل[2]**: ناوەڵناو/ ناوەڵکار. ١. چڵ ـ چڵ ٢. دەنکە ـ دەنکە ☰ ١. شاخه ـ شاخه ٢. دانه ـ دانه

**قلک** / qilk/: ناو. قللە: ١. جووت؛ جفت ٢. کڵاوی بەڕوو ☰ ١. جفت ٢. کُلاهک بلوط

**قللە** / qille/: ☜ **قلك**

**قلماسک** / qilmasik/: ☜ **قەڵماسك**

**قلمویچ** / qilmûyç/: ناو. قلمیچ: ١. ڕیپۆق؛ گوژاو؛ کیلک ٢. خلتە؛ بلخ ☰ ١. ژفک؛ قیِ چشم ٢. جِرم

**قلمیچ** / qilmîç/: ☜ **قلمویچ**

**قلنایەڤە** / qilnayeve/: چاوگ. بە قاقا خەستن ☰ بە قهقهه انداختن

**قلۆپ** / q(i)lop/: ناوەلناو. کەمئەندام؛ نوقسان؛ نوقوستان ☰ ناقص‌العضو

**قلۆپانی** / q(i)lopanî/: ناو. سەرمەقولات؛ سەرمەقولانج؛ مەحەلەق ☰ پُشتک

**قلۆت** / q(i)lot/: ناوەلناو. تایبەتمەندی زەوینی نەوی کە ئاوی تێدا دەوەستێ ☰ پست و گود (زمین)

**قلۆت ـ قلۆت** / qlot qlot/: ناوەلکار. یەک لە دووی یەک ‹ئەی هەمکە ئایەمە قلۆت ـ قلۆت هاتنە دەر و دەنگ دان› ☰ یکی پس از دیگری

**قلۆچ**[1] / q(i)loç/: ناو. سترۆ؛ شۆق؛ هیچک؛ شاخی حەیوان ☰ شاخ حیوان

**قلۆچ**[2]: ناوەلناو. ۱. خێل؛ خوێل؛ تیل ۲. تایبەتمەندی کەسێ کە چاوێکی لە چاوەکەی‌تری پچووکترە ☰ ۱. لوچ ۲. ویژگی کسی که یکی از چشمانش کوچکتر است

**قلۆر** / q(i)lor/: ناوەلناو. قورۆل؛ قولۆر؛ کلۆر؛ ناوبەتاڵ ☰ میان تُهی

**قلۆز** / q(i)loz/: ناوەلناو. ۱. شاخ بلند و ڕاست (بۆ شەک) ۲. [کنایە] خۆبایی؛ خۆبەزلزان ☰ ۱. دارای شاخ بلند و راست (شاک) ۲. خودبین؛ مُتکبر

**قلۆزان** / q(i)lozan/: چاوگ. ۱. سەرمەقولات دان ۲. تەقلە لێدانی پەلەوەر لە حەوادا ☰ ۱. پُشتک زدن ۲. پُشتک زدن پرنده هنگام پرواز

**قلوو** / q(i)lû/: ناو. نوخشانەی خراپ؛ پێش‌بینی ڕووداوی خراپ ☰ نفوس بد

**قلووچ** / q(i)lûc/: ناوەلناو. کۆم؛ کوور؛ پشت‌چەماو ☰ کوژپشت

**قلووژ** / q(i)lûj/: ناوەلناو. تەپەکراو؛ بە سەر یەکدا کۆوەبوو ☰ انباشته

**قلووس** / q(i)lûs/: ناو. منداڵ؛ ڕۆڵە ☰ فرزند

**قلوومک**[1] / q(i)lûmik/: ناو. ۱. ☜ **قەڵەمە ـ۱** ۲. وەڕەزی لەبەر باری بەقەوەت ۳. ژان؛ ئێشی زگ ☰ ۱. ☜ **قەڵەمە ـ۱** ۲. خستگی از بار سنگین ۳. دل‌درد

**قلوومک**[2]: ناوەلناو. وەڕەز لەبەر باری بەقەوەت ☰ خسته سنگینی از بار

**قلە** / q(i)le/: ناو. ۱. سکڵی تەواو سوور ۲. سووری بێ ڕەشایی سکڵ ۳. دانە؛ دەنک ‹بنی چەمەدانی ڕیش‌تاشینەکەم گەڕام، چوار قلە سیرم پەیدا کرد «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ ۱. اخگر تمام افروخته ۲. افروختگی اخگر ۳. دانە؛ حبّه

**قلەپۆپە** / q(i)lepope/: ناو. دوند؛ سەر لووتکە؛ بەرزترین شوێن (چیا و دار) ☰ اوج؛ بالاترین نقطه (کوه و درخت)

**قلەسەما** / q(i)lesema/: ناو. شادی و هەڵبەز و دابەز ☰ عمل بالا و پایین پریدن از شادی

**قلەقل** / q(i)leqil/: ناو. گرشەگرشی پۆلوو ☰ درخشش اخگر

**قلهـ** / q(i)lh/: ناو. بیچم؛ تەرح و دیدار ☰ سیما؛ قیافه

**قلهنگ** / qilhing/: ناو. قاقای پێکەنین ☰ قاه ـ قاه خنده

**قلی** / q(i)lî/: ☜ **قدیلکە**

**قلیان** / qilyan/: ناو. قەلوون؛ قەنگە؛ قەننە: ۱. قلیانی؛ قەلن؛ قەلنە؛ قەلوو؛ قەلین؛ قەلتە؛ قەندە؛ قولون؛ قەلەن؛ قلیاناوی؛ قلیان‌ئاوی؛ قەننەی ئاوی؛ کۆکۆس؛ نەرگیلە؛ نێرگەلە؛ نارگیلە؛ سەپەلیک؛ کەرەستەیەک بۆ دووکەڵ کردن بە تەماکۆ ۲. سەبیلەی کلک‌درێژ ☰ ۱. قلیان ۲. چُپُق دسته بلند

⊡ **قلیان ساز کردن**: ئامادە کردنی قلیان بۆ کێشان. هەروەها: **قلیان کێشان** ☰ قلیان چاق کردن

**قلیان‌ئاوی** / qilyan'awî/: ☜ **قلیان ـ١**

**قلیاناوی** / qilyanawî/: ☜ **قلیان ـ١**

**قلیاندار** / qilyandar/: ناو. بەردەفکی؛ ئێرگەلەچی ≡ قلیاندار

**قلیان‌قـــاوەڵتـــوون** / qilyanqaweltûn/: نـــاو. قلیان‌قاوەڵتی؛ تاشت؛ خواردنی سەر لە بەیانی ≡ خوراک قبل از صبحانه

**قلیان‌قاوەڵتی**/ qilyanqaweltî/: ☜ **قلیان‌قاوەڵتوون**

**قلیانی**[1] / qilyanî/: ☜ **قاورمه**

**قلیانی**[2]: ئاوەڵناو. قلیان‌کێش؛ خووگرتوو بـە قلیـان کێشان ≡ قلیانی

**قلیایەڤە** / qilyayeve/: چـاوگ. تریقانـەوە؛ قاقـا پێکەنین ≡ قاه‌قاه خندیدن

**قلی‌بلی** / q(i)lîb(i)lî/: نـاو. قلـی‌وبلـی؛ قلـێ‌بلـێ؛ قسەی وا کە تێ‌نەگەن ≡ سُخنان نامفهوم

**قلیج** / q(i)lîc/: ☜ **قلّیج**

**قلیچ**[1] / q(i)lîç/: نـاو. ١. گـوژاو؛ ڕچقـاوە؛ ڕیپـۆقی چاو ٢. ☜ **قلینچك** ≡ ١. ژفک؛ قی چشم ٢. ☜ **قلینچك**

**قلیچ**[2]: ئاوەڵناو. خاوەن چاوێکی بچووک و یەکی‌تـر زل ≡ با چشمانی کوچک و بزرگ

**قلیچان** / q(i)lîçan/: ☜ **قلینچك**

**قلیچک** / q(i)lîçik/: ناو. جـۆرە گۆچانێکـە سـەری وەک خاچ وایە ≡ نوعی عصای دست

**قلیک** / q(i)lîk/: نـاو. شمشێرەی درگا ≡ کلید قفل چوبین در

**قلینچک** / q(i)lînçik/: نـاو. قلـیچ؛ قلیچـان؛ تبلیـا بیچک؛ قامکەتووتە ≡ خنصر؛ انگشت کوچک

**قلینچکەســــــــلاو** / q(i)lînçkes(i)ław/: ☜ **قنچکەسلاو**

**قلی‌وبلی** / q(i)lî w b(i)lî/: ☜ **قلی‌بلی**

**قلێ‌بلێ** / q(i)lêb(i)lê/: ☜ **قلی‌بلی**

**قلێچکـە** / q(i)lêçke/: نـاو. کلێجـە؛ کلێنچکـــە؛ دووچکە؛ کەلێژ ≡ دُنبالچه

**قلێچە** / q(i)lêçe/: ناو. گیایەکە ≡ گیاهی است

**قلێر** / q(i)lêr/: ئاوەڵناو. گەمار؛ پـیس؛ چڵـکن ≡ کثیف

**قلێزەنگی** / q(i)lêzengî/: نـاو. چێشتێکە لە برنج و ئالووبخارا ≡ غذایی از برنج و آلوبُخارا

**قلێل** / q(i)lêl/: ئاوەڵناو. ١. کونا؛ کـون‌تـێ‌بـوو ٢. دیواندێو؛ کوناودیو ≡ ١. سوراخ ٢. سوراخ شده

**قلێنچک** / q(i)lênçik/: نـاو. جووچکـە؛ کلێجـە ≡ دُنبالچه

**قڵا** / q(i)ła/: ☜ **قالاو**

**قڵاجگ** / q(i)łacig/: ☜ **قشقەڕە ـ١**

**قڵاخ** / q(i)łax/: ناو. ١. قالاخ؛ دەوە؛ تەپاڵەی وشک ٢. ☜ **قڵاخدان** ≡ ١. تاپاله ٢. ☜ **قڵاخدان**

**قڵاخدان** / q(i)łaxdan/: ناو. قلاخ؛ هەماری تەپاڵـە ≡ تاپالەدان

**قڵادە** / q(i)łade/: ناو. قـەڵادە؛ قریتـە: ١. کـالان؛ سـانجی؛ ئاڵـقەی ملـی تـاژی ڕاو ٢. ملوانکـەی ئالقەیی ≡ ١. قـلادەی سـگ شـکاری ٢. گردنبنـد حلقەای زینتی

**قڵاش** / q(i)łaş/: ئاوەڵناو. لەت؛ شەق ≡ دونیم

**قڵاشتن** / q(i)łaştin/: چاوگ. لەت/ شـەق کـردن ≡ دونیمه کردن

**قڵاشـکەری** / q(i)łaşkerî/: نـاو. قەڵاشـــکەری؛ کۆتەرەداری بۆ سووتاندن ≡ کُندەی جنگلی

**قڵاف** / q(i)łaf/: ناو. کالان؛ کالەنی ≡ غلاف

**قڵاق** / q(i)łaq/: ☜ **قالاو**

**قڵانقۆزان** / q(i)łanqozan/: ناو. کـاردوو؛ کـاردی؛ گیایەکە لە چێشتی دەکەن ≡ گیاهی آشی

**قڵاووچ** / q(i)ławuç/: ناو. قەڵانقووچ؛ قەڵانقوچکە؛ کاری بە سەر یەکدا کردن تا بڵند دەبێ ≡ تلنبار

**قڵپ**[1] / qiłp/: ناو [کنایە] قرپ؛ قلم؛ ڕەوتی نەمان و لە بەین چوون ≡ نابودی

**قلّپ**[۲]: ئاوەڵناو. قلّم: ١. سەرنخوون ٢. [کینایە] فەوتاو؛ توونا؛ نابوود ☰ ١. واژگون ٢. نابود

⊡ **قلّپ بوونەوە:** قولپین: ١. سەرەونخوون بوون ٢. [کینایە] لە بەین چوونی ماڵ ☰ ١. واژگون شدن ٢. نابود شدن

**قلّپ کردنەوە:** ☜ قلّپاندنەوە

**قلّپ**[۳]: دەنگەناو. قلم: ١. قولت؛ دەنگی جۆشانی ئاو ٢. دەنگی ڕژانی ئاو لە دەفری ملباریکدا ☰ ١. غُل ـ غُل ٢. صدای ریزش آب از ظرف دهانه تنگ

**قلّپاندن / qiłpandin/:** چاوگ. ١. وە جۆش هاوردنی ئاو و ... لە سەر ئاگر ٢. ڕژاندنی ئاو و ... لە دەفری مل‌تەنگەوە ☰ ١. جوشاندن مایع ٢. ریختن مایع از ظرف دهانه تنگ

**قلّپاندنەوە / qiłpand(i)newe/:** چاوگ. قلّپ کردنەوە: ١. ڕژاندنی ئاو و ... لە دەفری مل‌تەنگ ٢. [کینایە] لە بەین بردنی ماڵ ☰ ١. ریختن مایع از ظرف دهانه تنگ ٢. نابود کردن مال

**قلّپن / qiłpin/:** ☜ قەڵپن

**قلّپە / qiłpe/:** ☜ قوڵ[۳]

**قلّتیان / qiłt(i)yan/:** چاوگ. کولانی ئاو و ... لە سەر ئاگر ☰ جوشیدن مایع بر آتش

**قلّچغ / qiłçiğ/:** ناو. داسوو؛ قەڵتاس؛ پرزەگوڵی گەنم و جۆ ☰ اخگل

**قلّخ / qiłx/:** ناو. ١. برینگ؛ برنگ ٢. قرخ؛ مووی کورتێ کە درێژ نابێ ☰ ١. دوکارد؛ قیچی پشم‌زنی ٢. موی کوتاه بی‌رشد

**قلّخاندن / qiłxandin/:** چاوگ. کۆخاندن؛ قۆزین ☰ سُرفه کردن

**قلّغ / qiłğ/:** ناو. ١. دیدار؛ بیچم ٢. بەرگ و شمەکی شڕ و دڕاو ☰ ١. ریخت؛ قیافە ٢. لباس ژنده

**قلّف / qiłf/:** ☜ قوڵف

**قلّم / qiłm/:** ☜ قلّپ

**قلّماندن / qiłmandin/:** چاوگ. فوارە کردن؛ بە تەوژمەوە دەرپەڕینی تراو ☰ فوّارە بستن

**قلّمە / qiłme/:** دەنگەناو. دەنگی فیچقە کردنی تراو بە تەوژمەوە ☰ صدای فوران مایع

⊡ **قلّمە کردن:** فیچقە کردن؛ توند دەرپەڕینی تراو ☰ فوّارە بستن

**قلّمە هاتن:** هاژە کردن؛ دەنگی تێپەڕینی تراو ☰ صدای مایع خروشان

**قلّنج / q(i)łinc/:** ناو. ١. قلیج؛ شیر؛ شمشێر ٢. بن‌هەنگڵ ☰ ١. شمشیر ٢. زیر بغل

**قلّەشان / q(i)łeşan/:** ☜ قەڵشان

**قلّەشاندن / q(i)łeşandin/:** ☜ قەڵشاندن

**قلّیاو / qiłyaw/:** ناو. ١. بووڵاوی سابوون ٢. زاخی ڕەش کە بۆ دەرمان دەشێ ☰ ١. آب و خاکستر صابون‌سازی ٢. زاج سیاه

**قلّیج / q(i)łîc/:** ناو. قلیج؛ شیر؛ شمشێر ‹شێخ هاتووە و گوتوویە: ناوی جنۆکەکانت هەڵدە تا بیانکوژم! ئەمن ئەمشەو بە قلیج (شیر) پێنجسەد جندۆکەی کافرم کوشتووە «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ شمشیر

**قلّیش / q(i)łîş/:** ناو. ١. درز؛ دەرز ٢. قەڵش؛ قەلەشت؛ درزی گوشاد ☰ ١. درز ٢. شکاف

**قلّیشان / q(i)łîşan/:** چاوگ. تێنەپەڕ. //قلیشای؛ دەقلیشێ؛ بقلیشێ// قلیشانەوە: ١. درز بردن ٢. تلیشیان؛ لە بەر یەک چوون ☰ ١. درز بردن ٢. شکافته شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: قلیشاو/ چاوگی نەرێنی: نەقلیشان

**قلّیشاندن / q(i)łîşandin/:** چاوگ. تێپەڕ. //قلیشاندت؛ دەقلیشێنی؛ بقلیشێنە// قلیشاندنەوە؛ قلیشان؛ قلیشاننەوە: ١. درز پێ دان ٢. لە بەر یەک بردن ☰ ١. تَرَک انداختن ٢. شکافتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەقلیشاندن

**قلّیشاندنەوە** / q(i)łîşand(i)newe/: ☜ **قلّیشاندن**

**قلّیشانن** / q(i)łîşanin/: ☜ **قلّیشاندن**

**قلّیشاننەوە** / q(i)łîşannewe/: ☜ **قلّیشاندن**

**قلّیشانەوە** / q(i)łîşanewe/: ☜ **قلّیشان**

**قلّیشاو** / q(i)łîşaw/: ئاوەڵناو. قلّیشاوە؛ قلّیشیاو: ١. درزبردوو ٢. لەبەریەکچوو ≡ ١. تَرَک برداشته ٢. شکافته

**قلّیشاوە** / q(i)łîşawe/: ☜ **قلّیشاو**

**قلّیشاوی** / q(i)łîşawî/: ☜ **قەڵشاوی**

**قلّیشنای** / q(i)łîşnay/: چاوگ. قلّیشاندن ≡ شکافتن

**قلّیشیاگ** / q(i)łîşyag/: ☜ **قەڵشاو**

**قلّیشیان** / q(i)łîşyan/: ☜ **قەڵشان**

**قلّیشیاو** / q(i)łîşyaw/: ☜ **قلّیشاو**

**قلّیشیای** / q(i)łîşyay/: چاوگ. قلّیشان ≡ شکافته شدن

**قلّینج** / q(i)łînc/: ناو. ١. قلّیج؛ قلّنج؛ قلیک؛ شمشێر ٢. قلّینجک؛ تووتە؛ ئەنگوستەچکۆلە ≡ ١. شمشیر ٢. خنصر؛ انگشت کوچک

**قلّینجک** / q(i)łîncik/: ☜ **قلّینج ـ٢**

**قلّیە** / qiłye/: ناو. ١. خۆڵەکەوەی سابوون ٢. قەلیە؛ جۆرێ چێشتە ≡ ١. خاکستر صابون‌سازی ٢. آش قلیه

**قلّێف** / q(i)łêf/: ناو. ١. کالان ٢. بەرگی شت ≡ ١. غلاف ٢. پوشش

▣ **قلّێف شکۆفە**: قۆزاخەی پەمۆ ≡ غوزەی پنبه

**قم**[١] / qim/: ناو. ١. ڕەمل؛ ڕەلم؛ ماسە ٢. فڕ؛ قوم؛ فرێ لە خواردنەوە ≡ ١. ماسه ٢. جُرعه

**قم**[٢]: ئاوەڵناو. نقوم؛ بناو ≡ غرق شده

**قم ـ**[٢]: پێشوشە. قومـ؛ بنـ ‹قمباو؛ قملاخ› ≡ غرق ـ

**قمار** / q(i)mar/: ناو. ١. یاری؛ بازی؛ کایە ٢. گەپ و گاڵتە ٣. فێڵ؛ حیله ≡ ١. بازی ٢. شوخی ٣. نیرنگ

**قماربـاز** / q(i)marbaz/: ئاوەڵناو. فێڵباز؛ ساختەچی ≡ مکّار

**قمباو** / qimbaw/: ناو. ئاودێریێ کە زەرعات داپۆشێ ≡ آبیاری‌ای که سطح کشت را بپوشاند

**قم ـ قم** / qim qim/: دەنگ. دەنگی کۆتر ‹قم ـ قم گاکۆتر قیژەی قژاکە/ ئەڵێی مەعرەکەی کاوە و زوحاکە! «قانع»› ≡ صدای نوعی کبوتر

**قمقمۆر** / qimq(i)mor/: ناو. قومقمۆر؛ ڕەهۆڵی تەنگ و تاریک ≡ دهلیز تنگ و تاریک

**قمقمۆک** / qimq(i)mok/: ☜ **قومقمۆك**

**قمقمۆکە** / qimq(i)moke/: ☜ **قومقمۆك**

**قمقمە** / qimq(i)me/: ☜ **قومقمۆك**

**قمل** / qiml/: ناو. سوون؛ سوونە؛ سن؛ کیسەڵە؛ ڕەقەک؛ ڕەقک؛ بەلا گەنمە؛ مێروویەکی مێملی گیا بەتایبەت گەنمە بە ڕەنگی سەوز، قاوەیی یان ئاوی کە بۆنێکی ناخۆشی لێوە دێ ≡ حشرەی سِن

**قملاخ** / qimłax/: ☜ **قوملاخ**

**قموش** / qimûş/: ☜ **قوموش**

**قمیش** / q(i)mîş/: ☜ **قوموش**

**قن** / qin/: ناو. ١. قنک؛ کولانە؛ جێ سانەوەی باڵندەی خۆماڵی لە شەودا ٢. ☜ **قنگ**[١] ٣. کاکڵی گوێز و بادام ٤. بێخ؛ بن؛ خوارووترین شوێن ≡ ١. آشیانەی ماکیان ٢. ☜ **قنگ**[١] ٣. مغز بادام و گردو ۴. ته؛ بن

**قنار** / q(i)nar/: ناو. چنگی دڕندە و باڵداری ڕاوکەر ≡ چنگال درّنده و پرندەی شکارچی

**قنان** / q(i)nan/: چاوگ. ڕزان؛ پرتووکیان؛ لە کەڵک کەوتن ≡ فرسودن

**قنانەوە** / q(i)nanewe/: چاوگ. ڕزانەوە؛ پرتووکانەوە ≡ فرسوده شدن

**قنب** / qinb/: ناو. کوولی داڕین بۆ دۆشاو تێدا گووشین ≡ معصرەی چوبین شیره‌سازی

**قنج** / qinc/: ئاوەڵناو. ١. قیت؛ ڕاست ‹گۆنا تەڕ، پاراو وەک گەلا وێنجە/ بالا بەرز و ڕێک، وەک چنار قنجە «فولکلۆر»› ٢. زۆپ؛ زەق ☜ ١. شَق‌ورق ٢. برجسته

▣ **قنج کردنەوە**: ١. ڕاستەوە کردن دوای چەمانەوە ٢. ڕاست وێستاندن ✱ هەروەها: **قنج بوون؛ قنج بوونەوە** ☜ ١. شَق کردن؛ از حالت خمیده بیرون آوردن ٢. راست ایستاندن

**قنجان** / qincan/: ☜ **قرنجان**

**قنجاندن** / qincandin/: ☜ **قرنجاندن**

**قنجک** / qincik/: ئاوەڵکار. پیچک؛ کەمێک؛ تۆزێک ☜ اندکی

**قنجکان** / qinc(i)kan/: چاوگ. قنچکان؛ تروشکان ☜ چُمباتمه زدن

**قنج و قیت** / qinc û qît/: ئاوەڵناو. ١. ڕاست و بێ‌گرێ بە سەر پاوە ‹خانووی ئەهالیش زۆریان دوو نهۆم/ هەندێ قنج‌وقیت هەندێ لار و کۆم «گۆران»› ٢. بەگوڕ؛ ساغ و سەرکەیف ☜ ١. استوار و پابرجا ٢. سرحال

**قنجەزەرد** / qincezerd/: ناو. گیایەکی پتەوی قایم و لووسە ☜ گیاهی است

**قنجەقنج**[١] / qinceqinc/: ناو. خۆڕانان و جحێڵی ‹قنجەقنجی گەنجی؛ هێشتایش قنجەقنجیەتی!› ☜ خودنمایی جوانانه

**قنجەقنج**[٢]: ئاوەڵکار. قیتەقیت؛ بە حاڵەتی ڕاست و نەچەماوە ☜ راست و ایستاده

**قنجیلانە** / qincîlane/: ئاوەڵناو. خنجیلە؛ خونجیلانە؛ خونجیلە؛ چکۆلەی جوانکیلەی خوێن‌شیرین ☜ کوچکِ زیبا

**قنچک**[١] / qinçik/: ناو. قونجک: ١. دەسکی باریکی دەنکە ترێ و مێوژ ٢. زیپکە؛ زیپک ☜ ١. دنبالەی دانەی انگور و مویز ٢. جوش پوست

**قنچک**[٢]: ئاوەڵکار. قونجک؛ کەمووسکەیەک ☜ اندکی

**قنچکان** / qinç(i)kan/: ☜ **قنجکان**

**قنچکاو** / qinç(i)kaw/: ناو. جێگەی ڕیپۆق لە چاو؛ سووچی چاو ☜ گوشەی چشم

**قنچکە** / qinçke/: ناو. زیپکە؛ زیپرک ☜ جوش پوست

**قنچکەسڵام** / qinç(i)kes(i)łam/: ☜ **قنچکەسڵاو**

**قنچکەسڵاو** / qinçkes(i)ław/: ناو. قلینچکەسلام؛ قنچکەسلاوە؛ قنچکەسلام؛ باپشکێو ☜ گُل‌مژه

**قنچکەسڵاوە** / qinçkes(i)ławe/: ☜ **قنچکەسڵاو**

**قندرغە** / qindirğe/: ناو. گیایەکە لە شۆرەکات شین دەبێ و ڕەنگێکی مەیلەو قاوەیی هەیە ☜ گیاهی بیابانی

**قنس** / qins/: ناو. پاژ؛ پارچە؛ بەش ☜ قطعه

**قنک** / qink/: ناو. قن؛ کولانە مریشک ☜ آشیانەی ماکیان

**قنگ**[١] / qing/: ناو. *[شووورەیی]* قن؛ قوون؛ کنگ؛ کن: ١. کونی پشتی گیاندار کە پیسایی لێ دەردەچێ ٢. سمت؛ سمتۆڵ؛ عننە؛ کەفەڵ ٣. بن؛ عننە؛ خوارترین بەشی هەر شتێ ٤. *[کینایە]* لێهاتوویی؛ توانایی ‹ئەو قنگی ئەم کارەی نییە› ٥. کونج؛ گۆشە ☜ ١. کون ٢. باسن ٣. ته؛ بُن ۴. پیزی؛ عُرضه ۵. گوشه

▣ **قنگ‌چاو**: تیل‌چاو؛ سیلەی چاو ☜ گوشەی چشم

▣ **قنگ پێ شل بوون**: *[پلار]* بەزین و واز هێنان لە توند و تیژی ☜ شکست خوردن و کوتاه آمدن

**قنگ خوران**: *[کینایە]* ١. حیز بوون ٢. بە ئازار بوون ☜ ١. کونی بودن ٢. کرم داشتن

**قنگ خوراندن**: *[کینایە]* ئیشتیا لە کردنی کارێک نەبوون ☜ تعلُل کردن

**قنگ دان**: ١. *[شووورەیی]* گان دانی نێر ٢. ☜ **قنگ دانەوە** ☜ ١. کون دادن ٢. ☜ **قنگ دانەوە**

**قنگ دانەوە**: *[کینایە]* قنگ دان؛ تاوێ ڕۆنیشتن

‹دە وەرە قنگێ بدەوە بـا ئیسـراحەت بکـەی!› 🇮🇷 اندکی نشستن

**قنگ گرتن:** فێرە دانیشتن بـوونی زارۆ 🇮🇷 تـوان نشستن یافتن بچە

**قنگ لە کەسێ هەڵکردن:** پشت کردن لە کەسـێ لە ڕووی قەست و غەرەزێکەوە 🇮🇷 پشـت کـردن بە کسی

**خستە قنگا** *[کینایە]* خسـتنە دواوە؛ تـەفرە پـێ دان ‹ئەنە کارەکەیان خستە قنگا تا فـەوتیا› 🇮🇷 بە تأخیر انداختن

**نیانە قنگا** *[کینایە، شوورەیی]* تەفر و توونا کـردن (ئەم دەسـتەواژە لـە دۆخـی تـووڕەیی و لـە ڕووی ناڕەزایەتییەوە دەگوترێ) 🇮🇷 یک وَرش گذاشتن

**هاتنە قنگا** دوابـەدوا ڕمـان و پسـان 🇮🇷 پـس افتادن

**قنگ ـ**[2]: پێشوشە. پاش ـ ‹قنگاو› 🇮🇷 پس ـ

**قنگاڵە** / qingałe/: نـاو. خوشـیلک 🇮🇷 گیـاهی بـا شیرەی مُسهل

**قنگانیسک**[1] / qinganîsk/: نـاو. زۆپـی ئانیشـک 🇮🇷 کوژی آرنج

**قنگانیسک**[2]: ئاوەڵـکار. لـە حاڵـی ڕاکشـان و بـە ئانیشک هەڵدانەوە 🇮🇷 در حالـت دراز کشـیدن و بـر آرنج تکیە دادن

**قنگاو** / qingaw/: نـاو. پاشـاو؛ ئـاوێ لـە زەوی دەردەچێ 🇮🇷 پساب آبیاری

**قنگاوقنگ** / qingawqing/: ئاوەڵـکار. دوابـەدوا؛ دواوەدوا 🇮🇷 عقب ـ عقب

**قنگبەگێچەڵ** / qingbegêçeł/: ئاوەڵـناو. *[مـەجاز]* قوونبەگێچەڵ؛ گێچـەڵوەقنـگ: ١. ئـاژاوەچی؛ شەڕبەشان؛ بشێونە ٢. هەمیشە خەریک و پـڕکار 🇮🇷 ١. فتنەانگیز ٢. پُرکار

**قنگپان** / qingpan/: ئاوەڵـناو. *[پلار]* دەپـەقوون؛ پاشلزەلام؛ سمت ئەستوور 🇮🇷 باسن گُندە

**قنگپووچەڵ** / qingpûçeł/: ئاوەڵـناو. *[مـەجاز]* قوونگچکە؛ قنگبووچک 🇮🇷 باسن‌تخت

**قنگخورووکە** / qingxurûke/: نـاو. نەخۆشـییەکی ئاژەڵە 🇮🇷 نوعی بیماری دام

**قنگدە** / qingde/: ☜ **قنگدەر**

**قنگـدەر** / qingder/: ئاوەڵـناو. *[شـوورەیی]* قنگـدە؛ قنگە؛ قنگەڵ؛ قونەک؛ قووندە؛ قووندەر؛ قووین‌دە؛ خوزگ؛ بە پشت؛ خوزچەک؛ گاندەر 🇮🇷 کونی

**قنگر** / qingir/: ☜ **کەنگەر**

**قنگرپاچ** / qingirpaç/: نـاو. قنگرواچ؛ بنەکەنگر 🇮🇷 بوتەی کنگر

**قنگرواچ** / qingirwaç/: ☜ **قنگرپاچ**

**قنگرەزا** / qing(i)reza/: ناو. چەوی کەنگر 🇮🇷 انگُم کنگر

**قنگزل** / qingzil/: ئاوەڵـناو. ١. *[شـوورەیی]* خـاوەن سمـت و کەفەڵـی گـەورە ٢. *[پـلار]* تەمـەڵ؛ تەوەزەل 🇮🇷 ١. دارای باسن بزرگ ٢. تنەلش

**قنگفش** / qingfiş/: ئاوەڵناو. *[پلار]* گیرنەدەر؛ با لێ بۆوە 🇮🇷 گوزیدە

**قنگقورس** / qingqurs/: ئاوەڵناو. *[کینایـە، شـوورەیی]* قنگ‌گران؛ قوون‌گران؛ قوونقـورس؛ تەمبـەڵ 🇮🇷 کون‌گشاد

**قنگگران** / qingg(i)ran/: ☜ **قنگقورس**

**قنگلاشـک** / qinglaş(i)k/: نـــاو. قنگلاشـــــک؛ قانگەلاش؛ قانگەلاشک ‹وتیان: قنگلاشـک مـاوات کوێنەس؟ وتی: بـا ئـەزانێ! «قسـەی نەسـتەق»› 🇮🇷 بتەی خشک کنگر

**قنگلێکەوتـو** / qinglêkewtû/: ئاوەڵـناو. *[کینایـە]* قوونلێکەوتوو؛ تایبەتمەندی کەسێ کە پشـتێن و دەرپێی هەر داخزێ 🇮🇷 شلختە

**قنگلاشک** / qingłaş(i)k/: ☜ **قنگلاشک**

**قنگە**[1] / qinge/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **قنگـدەر** ٢. *[پلار]* کۆنەپەرست 🇮🇷 ١. ☜ **قنگدەر** ٢. اُمُل

**قنگە ٢**: پێشوشە. ١. بن یا بەشی دوایی هەر شتێ ‹قنگەتەشی؛ قنگەدڕک› ٢. *[مەجاز]* کورت و کەمبڕ ‹قنگەشەڕ؛ قنگەخەو› 🇮🇷 ١. دنباله ٢. مُختصر

**قنگەبان** / qingeban/: ناو. گوێسوانەی پشت بان؛ سوانەی پشتەوەی بان 🇮🇷 لبەی عقبی بام

**قنگەپاژنە** / qingepajne/: ناو. پاژنەی پێ 🇮🇷 پاشنەی پا

**قنگەجن** / qingecin/: ☜ قنگەجنۆکە

**قنگەجنۆکە** / qingec(i)noke/: ناو. *[کینایە]* قنگەجن؛ قوونەجند؛ شوێنی تەنگەبەر 🇮🇷 جای تنگ

**قنگەجوورە** / qingecûře/: ناو. ئێسکی پاش قنگی مریشک 🇮🇷 استخوان بندی تُخمدان مرغ

**قنگەجوولە** / qingecûłe/: ☜ قنگەجوولێ

**قنگەجوولێ** / qingecûłê/: ناو. *[کینایە]* قنگەجوولە؛ دۆخی بێئۆقرە بوون بۆ ڕۆیشتن 🇮🇷 بیقراری برای رفتن

**قنگەخشکێ** / qingexişkê/: ناو. قنگەخلیسکێ؛ قنگەلیشکێ؛ کنگەخشکێ؛ کاری لە سەر قنگ خزین 🇮🇷 کونخیزه

**قنگەخلیسکێ** / qingex(i)lîskê/: ☜ قنگەخشکێ

**قنگەخەو** / qingexew/: ناو. قوونەخەو؛ قنەخەو؛ عنەوەنەوزە: ١. کاری خەوتن بە ڕۆنیشتنەوە ٢. سەرخەو؛ خەوێکی کورت و ناتەواو 🇮🇷 ١. خواب نشسته ٢. پینکی؛ خواب مُختصر

**قنگەدڕک** / qinged(i)řik/: ناو. دڕووی کەنگر 🇮🇷 خار کنگر

**قنگەر** / qinger/: ناو. کەنگەر؛ قنگر 🇮🇷 کنگر

**قنگەزە** / qingeze/: ناو. ڕەسەن؛ ڕەگەز؛ ڕەچەڵاک 🇮🇷 نسل

**قنگەسۆڵە** / qingesołe/: ناو. *[پلار]* تووڕەیی و ڕقی زۆر لە بەر ئێرەیی و ناتەواوی 🇮🇷 کونسوزه

**قنگەسووتەکە** / qingesûteke/: ناو. ١. ئافەتێکی مەرەزە ٢. نەخۆشییەکی زارۆی ساوایە 🇮🇷 ١. از آفات شالی ٢. از بیماری‌های نوزادان

**قنگەسیگار** / qingesîgar/: ناو. قنەسیگار؛ فیلتەر؛ هەورئاسای بنی جگەرە 🇮🇷 فیلتر

**قنگەسێوەر ١** / qingesêwer/: ناو. شوێنێ گچکە لە کەژ و لاپاڵی چیا کە زوو سێبەر دەیگرێ 🇮🇷 سمت سایەسار کوه

**قنگەسێوەر ٢**: ناوەڵناو. فێرەسێوەر؛ تایبەتمەندی کەسێ یان گیاندارێ کە هەر حەز دەکا لە سێوەر بێ 🇮🇷 سایەدوست

**قنگەشەڕ** / qingeşeř/: ناو. وردەجەنگ؛ کاری پەلامار دان و ڕاکردن 🇮🇷 جنگ و گُریز

**قنگەقنگ ١** / qingeqing/: ناو. *[کینایە، پلار]* کاری خۆ دزینەوە لە کار ‹دیارە دڵی پێوە نییە، هەر قنگەقنگیەتی و نارِوا› 🇮🇷 اهمال در کار

**قنگەقنگ ٢**: ناوەڵکار. دوا ـ دوا؛ پشتاوپشت ‹لە سەر بانەکە قنگەقنگ چوو تا کەوتە خوارەوە› 🇮🇷 عقب ـ عقب

**قنگەکەو** / qingekew/: ☜ قوونەکەو

**قنگەگاز** / qingegaz/: ناو. قوونەگاز؛ برینی پشتی یەکسم لە زین و کورتان 🇮🇷 زخم پشت ستور از زین و پالان

**قنگەگان** / qingegan/: ناو. *[شوورەیی]* قوونەگان؛ نێربازی 🇮🇷 همجنس‌بازی مردان

**قنگەل** / qingel/: ☜ قنگدەر

**قنگەلاشک** / qingelaş(i)k/: ☜ قانگەلاش

**قنگەلاشکە** / qingelaşke/: ناو. کڵناشک؛ قانگەلاشک 🇮🇷 گیاه خُشک بادبرده

**قنگەلیشکێ** / qingelîşkê/: ☜ قنگەخشکێ

**قنگەڵتس** / qingełtis/: ناو. قنگەڵفس؛ قوونەڵتس؛ قوونەڵفس؛ تووتەکانی گورگ و سەگ. هەروەها: **قنگەڵتس دان** 🇮🇷 چُمباتمەی سگ و گرگ

**قنگەڵفس** / qingełfis/: ☜ قنگەڵتس

**قنگەمانگا** / qingemanga/: ناوەڵناو. *[بڵار]* ناحەز؛ ناشیرین ☰ بدریخت

**قنگەنشین** / qingen(i)şîn/: ☜ **قونەنشینە**

**قنگەنشینکە** / qingen(i)şînke/: ☜ **قونەنشینە**

**قنگەنشینە** / qingen(i)şîne/: ☜ **قونەنشینە**

**قنگەوتلور** / qingewt(i)lûr/: ناوەڵکار. قوونتلوور؛ قوونەوتلوور؛ دەمەوڕوو ڕاکشاو ☰ دمر افتاده

**قنگەوڕک** / qingewřik/: ناوەڵکار. *[بڵار]* پێچەوانە؛ چەپەوانە ‹قنگەوڕک لە قسە حالی دەبێ!› ☰ عوضی

**قنگهەڵەتەکێنە** / qinghełtekêne/: ناو. قوونهەڵتەکێنە؛ بەرگایلکە ☰ دُمجُنبانک

**قنە** / q(i)ne/: ☜ **قونە**

⊡ **قنە کردن:** قونە کردن؛ کەوتنە قنەوە ‹کەو قنەی دەکرد لەو بەر پەسارە/ لە قەل شیرین هات ئەو لەنجە و لارە «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ خرامیدن

**کەوتنە قنەوە:** ☜ **قنە کردن**

**قنەخەو** / q(i)nexew/: ☜ **قنگەخەو**

**قنەر** / q(i)ner/: ☜ **قنگەر**

**قنەقن** / q(i)neqin/: ناو. هەڵبەزـ دابەز ☰ ورجه ـ وورجه

**قنیات** / qinyat/: ناو. قەینات؛ قینات؛ سەبووری ☰ شکیبایی

**قنینچکەسڵام** / q(i)nînçkes(i)łam/: ناو. دیقلۆک؛ دیکلۆک؛ باپشکێو؛ زیتکەسلام؛ چینچکەسڵاو ☰ گُل‌مُژه

**قوار** / q(i)war/: ☜ **قەوار ـ٢**

**قواڕ** / q(i)wař/: ناو. خۆڵەکەوەی پزیسکی تەنوور ☰ خاکستر تنور

**قوازتنەوە** / q(i)wazt(i)newe/: چاوگ. قۆزتنەوە؛ قۆستنەوە ‹بۆ قوازتنەوەی تا ئەکەوتە کار/ زۆردار لێی ئەفڕان یەکەم پەلامار «گۆران»› ☰ قاپیدن

**قواش** / q(i)waş/: ناو. ١. کووتاڵ؛ پارچە ٢. چەشن؛ جۆر ☰ ١. قُماش؛ پارچە ٢. نوع؛ طور

**قواقو** / q(i)waqû/: ناو. زەنا- زەنا؛ هەرا و هوریا ☰ غوغا؛ هیاهو

**قوب**[١] / qub/: ناو. ١. قوبک؛ گومەز؛ بانی بە تاق دروستکراوی بڵند ٢. دوگمە؛ قومچە؛ پشکوژ ☰ ١. گُنبد ٢. دُکمه

**قوب**[٢]: ناوەڵناو. قوبان؛ زۆپ؛ زەق؛ قوت ☰ برجسته

**قوبا** / quba/: ناو. ماستی باش نەمەییوی شل و خراپ ☰ ماست شُل

**قوباد** / qubad/: ناو. جۆرێک شێرماسی ☰ ماهی قُباد

**قوبالە** / qubale/: ناو. دۆلابی دیواری ئۆدە بۆ جێگەی نوێن ☰ کُمُد جای رختخواب

**قوبان**[١] / quban/: ☜ **قوپان**

**قوبان**[٢]: ناوەڵناو. قوب؛ زۆپ؛ زەق ☰ برجسته

**قوباندن** / qubandin/: چاوگ. ١. زۆپ کردن؛ زەق کردن ٢. ☜ **قوپاندن** ☰ ١. برجسته کردن ٢. ☜ **قوپاندن**

**قوببە** / qubbe/: ناو. قوبە: ١. قوب؛ گونبەز؛ گونبەت ٢. دڕۆشمی سەرشانی ئەفسەران ٣. دوگمەی جلک ☰ ١. گُنبد ٢. سردوشی افسران ٣. دُکمه

**قوبک**[١] / qub(i)k/: ناو. قوبکە؛ گونبەز؛ قوب ☰ گُنبد

**قوبک**[٢]: ناوەڵناو. قوبکە؛ زۆپ ☰ برجسته

**قوبکە**[١] / qubke/: ناو. ١. ☜ **قوبک**[١] ٢. ترۆپکی چیا ☰ ١. ☜ **قوبک**[١] ٢. قُلەی کوه

**قوبکە**[٢]: ☜ **قوبک**[٢]

**قوبلە** / quble/: ☜ **قیبلە**

**قوبڵە** / qubłe/: ☜ **قیبلە**

**قوبڵی** / qubłî/: ☜ **قبوڵی**

**قوبوڵ** / qubûł/: ☜ **قەبوڵ**

**قوبه / qube/:** ☜ **قوببه**

**قوپ / qup/:** ناو. ١. قـوم؛ فـرێ ئـاو ٢. قوپـاوی؛ قوپیاگی ☰ ١. جُرعه ٢. قُر؛ فرورفتگی

**قوپارچ / quparç/:** ☜ **قەرپاچ**

**قوپان / qupan/:** چاوگ. تێنەپەر. //قوپای؛ دەقوپێی؛ بقوپێ// قوبان؛ قوپیان؛ قۆپـان؛ ڕۆچـوون ‹جێگـه بوخچەکەشم بەرچاو هات کە دە بەفر قوپابوو «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ فرورفتن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: قوپـاو/ چـاوگی نـەرێنی: نەقوپان

**قوپـانـدن / qupandin/:** چـاوگ. تێـپەر. //قوپانـدت؛ دەقوپێنی؛ بقوپێنـه// قوبانـدن؛ قوپـانن؛ قۆپانـدن؛ ڕۆچواندن ☰ قُر کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەقوپاندن

**قوپانن / qupanin/:** ☜ **قوپاندن**

**قوپاو / qupaw/:** ئاوەڵناو. قوپیاگ؛ قووپاو؛ ڕۆچـوو ‹لـە سـەر بەرزاییەکـەوە لـە بـەفری مـۆرم ڕوانی، شوێنێکی درێژی قوپاوم بەدی کرد، زانیم جۆگەیـە و ئەوسەری دەگاتە ئاوایی «هەژار، چێشـتی مجێـور»› ☰ فرورفته

**قوپاوی / qupawî/:** نـاو. ڕووخە؛ قـوپ؛ قوپیـاگی؛ چاڵی؛ فیس ☰ فرورفتگی

**قوپچه / qupçe/:** نـاو. قوپکە؛ قوببە؛ قوبە؛ قۆپچـە؛ دوگمە ☰ دُکمه

**قوپژ / qupj/:** ☜ **قومپۆز**

**قوپکه / qupke/:** ☜ **قوپچه**

**قوپنای / qupnay/:** چـاوگ. قپیای؛ قوپاندن ☰ قُر کردن

**قوپیاگ / qupyag/:** ☜ **قوپاو**

**قوپیاگی / qupyagî/:** ☜ **قوپاوی**

**قوپیان / qupyan/:** ☜ **قوپان**

**قوپیای / qupyay/:** چاوگ. قوپان ☰ فرورفتن

**قوت[١] / qut/:** ناو. ١. ڕەوتی بـڕان ٢. کـار و ڕەوتی لێ دان ☰ ١. قطع ٢. عمل زدن

⊡ **قوت کردن:** بڕین؛ قرتانن؛ قرتاندن ☰ قطع کردن

**قـوت[٢]:** ئاوەڵـناو. ١. زۆپ؛ زەق ٢. هەسـتۆک؛ لەسەرهەسـت ٣. سڵـکەر؛ قوشـقی چڵـەک ٤. کورت؛ کوڵ؛ کۆتا ٥. خـەلاس؛ تـەواو ٦. *[کینایه]* فیسن؛ لەخۆبایی ٧. گوێبەل ‹بزنی قـوت› ☰ ١. برجسته ٢. حسّاس ٣. رموک ۴. کوتاه ۵. تمام شده ۶. پُرافاده ٧. گوش برجسته

⊡ **قوت بـون:** ١. سڵ بوون؛ هاتنـه سـەر هەسـت ‹کاکە! ئەوە لە چی قوت بـووی؟ چ قـەوماوە؟› ٢. بە دەمار و فیسن بوون ‹ئەو کوڕە بووچکیانە فرە قوتە، کەس بە هیچ نازانێ› ☰ ١. حساس شُدن ٢. پُرمُدعا بودن

**قوت کردن:** خەلاس کردن ☰ به پایان رساندن

**قوت کردنەوە:** ١. بەرز و زۆپ کردنەوە؛ بە زەقی شان دان ‹ئەو هێسترە وا گوێی قـوت کردۆتـەوە، دیارە شتێکی دیوە› ٢. بڵـند کـردن؛ ڕا کـردن؛ ڕاست کردنەوە ☰ ١. شَق کردن ٢. بلند کردن

**قوتا / quta/:** ☜ **قوتار**

**قوتاب / qutab/:** ناو. قتاو؛ قوتاو: ١. پەڕاو؛ کتێـب ٢. قوتابی؛ خوێندکار ٣. ☜ **قوتتاب** ☰ ١. کتـاب ٢. شاگرد مدرسه ٣. ☜ **قوتتاب**

**قوتابخانه / qutabxane/:** نـاو. قتاوخان؛ قتاوخانە؛ قوتاوخانە: ١. کتێبخانە ٢. قوتابیخانـە؛ فێرگـەی زارۆکان ٣. ڕێباز؛ ڕێوشوێنێکی دیـار و تایبـەت کـە لـە بەرهـەمی هونەرمەنـد، نووسـەر یـان دەورەیەکـدا بـەدی دەکـرێ * هـەروەها: **قوتابخانەیی** ☰ ١. کتابخانه ٢. دبستان ٣. مکتب

**قوتابی / qutabî/:** نـاو. قتـاوی؛ قوتـاوی؛ زارۆکـی فێرگە ☰ دانش‌آموز دبستانی

**قوتابیخانه / qutabîxane/:** ☜ **قوتابخانه ـ٢**

**قوتـاخ / qutax/:** نـاو. تـازەلاوێ کـە بەردەسـتی وەرزێرە ☰ نوجوان پیشکار کشاورز

**قوتار**[1] / qutar/: ئاوەڵناو. قوتا؛ قورتاڵ؛ قورتار: ١. ڕزگار؛ ئازاد ‹لە ئەولای کەس قوتار نابێ، چ مـوئمین بێ چ کافر بێ/ لە ئەملاش کەس خەلاس نابێ، لە هیند و دەیلەم و زەنگی «حاجی قادر»› ٢. خەلاس؛ براو ‹قووتی دا زستان هەچی بوو، قـووتی حەیوان و بەشەر/ کا لە کادێن بوو قوتار و گیا لە قۆریە و گیشەدا «ئاوات»› ☰ ١. رها ٢. تمام

▣ **قوتار بوون**: ١. ڕزگار بـوون ‹بـە فرکەفـرک لـە دەستی قوتار بووم› ٢. تەواو بوون ‹ئاردمان قوتار بووە›. هەروەها: **قوتار کردن** ☰ ١. رها شدن ٢. به اتمام رسیدن

**قوتار**[2]: ئامراز. قوتا؛ قورتاڵ؛ قورتـار؛ بـەس؛ تـەنیا ‹خالۆ و خالۆژن هاتن و قوتار› ☰ بس

**قوتان**[1] / qutan/: چاوگ. ١. لـێ دان بـە دار و مست ٢. کوتـانی دەخـڵ و شـتی‌تـر ٣. دەم تێوەردان؛ خۆ تـێ کوتـان ٤. قوتیـان؛ کـۆخین؛ قۆزین ☰ ١. زدن؛ کتک‌کاری کردن ٢. کوبیدن ٣. فضولی کردن ۴. سُرفه کردن

**قوتان**[2]: ناو. کەڵک؛ باڵندەی سەقا ☰ پلیکان

**قوتاندن** / qutandin/: چـاوگ. قوتـانن: ١. کوتانـدن؛ کوتـانن ٢. کۆخانـدن؛ قـۆزین ☰ ١. کوبیدن ٢. سُرفه کردن

**قوتانن** / qutanin/: ☜ قوتاندن

**قوتاو** / qutaw/: ☜ قوتاب

**قوتاوخانە** / qutawxane/: ☜ قوتابخانە

**قوتاوی** / qutawî/: ☜ قوتابی

**قوتایی**[1] / qutayî/: ناو. زۆپـایی؛ زەقـایی ☰ برجستگی

**قوتایی**[2]: ئاوەڵناو. ١. دارکـاری‌کـراو ٢. کـوتراو؛ هاڕدراو ☰ ١. کتک‌خورده ٢. کوبیده شده

**قوتب** / qutb/: ناو. قـودب: ١. جەمسـەر؛ سـەر و بنی هەر شتێکی تۆپەڵ، بەتایبەت گۆی زەوی ٢. پیری تەریقەتی زۆر جـێ گـەورە ☰ ١. قُطب ٢. پیشوای درویشان؛ قُطب طریقت

**قوتبڕاو** / qutb(i)řaw/: ئاوەڵناو. بـەش‌خـوراو؛ بێبەش ☰ محروم

**قوتتاب** / quttab/: نـاو. قوتـاب؛ شـەکەرلەمە؛ لەبزینە؛ جۆرێک شیرینی لە ئـاردی سـپی، ڕۆن، گولاو، گوێز و خاکەقەن ☰ قُطاب

**قوتتە** / qutte/: ناو. جـانووی دووسـالان ☰ کُره اسب دو ساله

**قوتحە** / quthe/: ئاوەڵناو. هەڵبژاردە؛ ژماردە؛ بژاره ☰ مُمتاز

**قوتراو** / qutraw/: ئاوەڵناو. لێـدراو؛ دەسـت لـێ وەشراو ☰ کتک خورده

**قوتف** / qutf/: ناو. سڕی؛ تەزی سەرما ☰ کرختی از سرما

**قوتفین** / qutfîn/: ☜ قەڕسان

**قوتک** / qutik/: ناو. کورتەک؛ سەڵتە؛ بالاپۆشی بە دوگمەی ناو تێخراوی تـا بـەر پشـتێند ☰ قبای نیم‌تنه

**قوتکە** / qutke/: ناو. ١. دونـدی چیـا؛ لووتکـەی کێف ٢. لووتکەی گرد؛ سەر تەپۆڵکە ٣. قـوتی؛ زەقـی؛ زۆپـی ☰ ١. قلـەی کـوه ٢. بـالای تپـه ٣. برجستگی

**قوتم** / qut(i)m/: ناو. قـورم؛ بنـەداری بـڕاوی لـە زەمیندا ماو ☰ ته درخت در زمین مانده

**قوتمسان** / qutm(i)san/: چـاوگ. هەڵپسـان؛ هەلاوەسران ☰ آویخته شدن

**قوتمساندن** / qutm(i)sandin/: چـاوگ. هەڵپساندن؛ هەلاوەسین ☰ آویختن؛ آویزان کردن

**قوتنی** / qutnî/: ناو.پارچەیـەکی ڕێ ـ ڕێیـە بـۆ پشتەکەوا دەبێ ☰ نوعی پارچه

**قوتو** / qutû/: ناو. قالـک؛ دەفـری چکۆلـەی بـە سەرپۆش بۆ وردە شت ☰ قوطی

**قوتوودەم** / qutûdem/: ئاوەڵناو. دەمبیچکۆلانـە؛

خاوەن دەم و لێوی بچووک 🇮🇷 غُنچەدهن

**قوتوله** / qutûle/: ناو. ١. قوتووی زۆر پچووک ٢. چرافتیله ٣. ☜ **قۆتەره** 🇮🇷 ١. قـوطی کوچـک ٢. چراغموشی ٣. ☜ **قۆتەره**

**قوتومه** / qutûme/: ☜ **قۆتەره**

**قوته**[١] / qute/: ناو. قوتابی؛ خوێندکار 🇮🇷 دانشآموز

**قوته**[٢]: ئاوەڵناو. ١. سڵ و لەسەر هەست ٢. زیت و زیرەک ‹هەتیوێکی قوتەم لێ پەیدا بـوو، بـە تـورکی تێی ڕاخوڕیم ... «هـەژار، چێشـتی مجێـور»› 🇮🇷 ١. گوش به زنگ ٢. زبر و زرنگ

**قوته**[٣]: دەنگ. وشەیەک بۆ بانگ کردنی گەماڵ 🇮🇷 کلمەای برای صدا زدن سگ

**قوتەقوت** / qutequt/: ناو. ١. سـەرەتاتکێ؛ کـاری ڕوانین به دزییەوه ٢. *[پلار]* لووتبەرزی؛ دەعیـه و دەمار 🇮🇷 ١. کار سَرَک کشیدن ٢. افاده

**قوتـەک** / qutek/: نـاو. ١. قوتـــک؛ سەڵـــته ٢. سوخمەی بێقۆڵ 🇮🇷 ١. قبای نیمتنه ٢. یلک

**قوتەکه** / quteke/: ئاوەڵناو. وتەڵە؛ زرنگی چکۆلـه 🇮🇷 کوچولوی زرنگ

**قوتی** / qutî/: ناو. سنگە؛ قوتکه 🇮🇷 برآمدگی

**قوتیان** / qutyan/: ☜ **قوتان**[١] **ـ٤**

**قوتیلخ** / qutîlix/: ☜ **قۆدك**

**قوتیلکه** / qutîlke/: ☜ **قوتیله ـ١**

**قوتیلکەچرا** / qutîlkeç(i)ra/: ☜ **قەندیله ـ١**

**قوتیلله** / qutîlle/: ☜ **قوتیله**

**قوتیله** / qutîle/: ناو. قوتیلله: ١. قوتیلکه؛ قوتووی پچـووک ٢. قودیلـه؛ چـرای فتیلـه ٣. ئاوێنـەی گیرفـان 🇮🇷 ١. قـوطی کوچـک ٢. چـراغ موشـی ٣. آینەی جیبی

**قوتیلەچرا** / qutîleç(i)ra/: ☜ **قەندیله ـ١**

**قوچبن** / quçbin/: ☜ **قوزبن**

**قودب** / qudb/: ☜ **قوتب**

**قودیک** / qudîk/: ☜ **قۆدی**

**قودیله** / qudîle/: ☜ **قوتیله ـ٢**

**قودیلەچرا** / qudîleç(i)ra/: ☜ **قەندیله ـ١**

**قور** / qur/: ↓

⊡ **قور بوون:** گوێ ڕاداشتن؛ باش گوێ گرتن 🇮🇷 با دقت گوش دادن

**قورئان** / qur'an/: ناو. قـرۆنێ؛ قورعـان؛ قورحـان؛ کتێبی ئایینی موسوڵمانان 🇮🇷 قرآن

⊡ **قورئـان پـەڕە ـ پـەڕە سـوتاندن:** *[کنایە]* لای موسوڵمان سوێندێکی قورسە، واتا: درۆ ناکـەم 🇮🇷 سوگندی است

**قورئان خواردن:** *[کنایە]* سوێند خواردن به قورئان 🇮🇷 سوگند به قرآن خوردن

**قورئـان لـە بـەینا بـوون:** *[کنایـە]* ١. سـوێند بـه قورئان خواردن ٢. قورئان بـەرگری لـه بـەلا و نەهامەت بکا 🇮🇷 ١. سـوگند بـه قـرآن خـوردن ٢. قرآن مانع بلا شدن

**قورئـان هاوردنـه حاجـەت کەسێ:** داوا کـردن لـه کەسێ بۆ کردن یا نەکردنی کارێ بـه خـاتری قورئان 🇮🇷 پناه بردن یا التجا کردن به قرآن

**قورئانخوێن** / qur'anx(i)wên/: ناو. قورعانخوێن؛ کەسێ که قورئان دەخوێنێ 🇮🇷 قاری قرآن

**قورباق** / qurbaq/: ☜ **قربۆق**

**قوربـان** / qurban/: نـاو. قـوروان: ١. وشـەی ڕێـز گــرتن ‹هــەم واریســی فــەرهادم و هــەم نــائیبی مەجنوون/ وا تێمەگه قوربان، که گەدا بولهەوەسێکم «نالی»› ٢. بەلاگێڕ؛ سەرگەرد ‹قوربانـی ڕوخت بم که شکسـتی بـه قەمـەر دا/ حـەیرانی لـەبت بم کـه ڕەواجی به شـەکەر دا «تـاهیر بـەگ»› ٣. گۆشـتی خێرێ له جەژنی گەورەدا ٤. حەیوانی خێرێ ٥. مانگی دوامینی ساڵی مـانگی موسوڵـمانان 🇮🇷 ١. قُربان؛ کلمەی احترام ٢. فدایی ٣. گوشـت قربـانی ٤. حیوان قربانی ٥. ماه ذیالحجه

⊡ **بە قوربانی (کەسێک) بـوون:** لـه بـەر (کەسـێک)

مردن ‹سا خۆم بە قوربان تاریکی یانەت/ ئەو ماوای دەیجوور چۆل و وێرانەت! «مەستوورە»› 🇮🇷 قربان صدقه(ی کسی) رفتن

**قوربانگا** / qurbanga/: ناو. شوێنی قوربانی کردن 🇮🇷 قُربانگاه

**قوربانی** / qurbanî/: ناو. قوروانی: ١. گۆشتی قوربان ٢. حەیوانی قوربان ٣. *[کینایە]* کەسێ کە بێ‌گونا دەکوژرێت یان وە بەر بێدادێ دەکەوێ ‹قوربانی شەڕ› 🇮🇷 ١. گوشت قربانی ٢. حیوان قربانی ٣. قربانی

⊡ **قوربانی بوون**: *[کینایە]* تێدا چوون لە پێناو کەس یان شتێکدا 🇮🇷 قربانی شدن

**قوربانی کردن**: سەر بڕینی ئاژەڵێک بۆ خێر 🇮🇷 قربانی کردن

**قورپ** / qurp/: ئاوەڵناو. قورک؛ کورک؛ مەلی کڕکەوتوو 🇮🇷 کُرچ

**قورپاچ** / qurpaç/: ناو. قامچی؛ تازیانە؛ شەلاخ 🇮🇷 تازیانه

**قورپێنە** / qurpêne/: ناو. قوڕقێنە؛ قرپ؛ کوفک 🇮🇷 آروغ

**قورت**[1] / qurt/: ناو. ١. قووت؛ ڕەوتی لە گەروو چوونە خوار ٢. باڵدارێکە 🇮🇷 ١. بلع؛ قورت ٢. پرنده‌ای است

**قورت**[2]: ئاوەڵناو. قوم؛ نوقم؛ نقۆ؛ تەپاو لە ئاو یان تراوی تردا 🇮🇷 غوطه‌ور

**قورتار** / qurtar/: ☜ قوتار

**قورتاڵ** / qurtał/: ☜ قوتار

**قورتاندن** / qurtandin/: چاوگ. قورتانن: ١. قووت دان؛ لە گەروو ناردنە خوار ٢. لچ هەڵقرچاندن 🇮🇷 ١. بلعیدن ٢. لب گزیدن

**قورتانن** / qurtanin/: ☜ قورتاندن

**قورتم** / qurtim/: ناو. ١. قوریژنگ؛ سووریژنچکە؛ زەنگلۆک ٢. قرتم؛ خورتووم ٣. توورەکەی ملی کەڵک 🇮🇷 ١. سُرخنای ٢. خرطوم ٣. کیسه‌ی گردن پلیکان

⊡ **قورتم لێ دان**: قوم لێ دان؛ نیانە سەرەو 🇮🇷 هورت کشیدن

**قورتن** / qurtin/: ناو. دارێکی لێڕەوارە 🇮🇷 درختی جنگلی

**قورتنای** / qurtnay/: چاوگ. قورتاندن 🇮🇷 بلعیدن

**قورتیس** / qurtîs/: ناو. ڕیشە؛ ڕیشگ 🇮🇷 ریشه

**قورتیک** / qurtîk/: ناو. کاری قووت دان 🇮🇷 بلع

**قورچ** / qurç/: ناو. ١. سووچ؛ قوژبن؛ گۆشە ٢. قوم؛ فڕ 🇮🇷 ١. گوشه ٢. جُرعه

**قورچاندن** / qurçandin/: چاوگ. ١. قووت دانی پاروو ٢. فڕ کردن؛ نیانە سەرەو 🇮🇷 ١. بلعیدن ٢. نوشیدن

**قورچمین** / qurç(i)mîn/: چاوگ. هەڵپچڕکاندن؛ پساندنی گیا و گوڵ 🇮🇷 قطع کردن گُل و گیاه

**قورچی** / qurçî/: ☜ قورنج

⊡ **قورچی کرن**: ☜ قورنجاندن

**قورحان** / qurĥan/: ☜ قورئان

**قورحە** / qurĥe/: ناو. ١. برینی گەدە و ڕیخۆڵە ٢. ☜ قورعە 🇮🇷 ١. زخم دستگاه گوارش ٢. ☜ قورعه

**قورخ** / qurx/: ناو. قورخ؛ کاروانکوژە؛ ناهید؛ ناهی؛ زل؛ ئەستێرکە؛ ئەستێرەگەشە 🇮🇷 ستاره‌ی سحر(ی)

**قورس**[1] / qurs/: ناو. ١. ئەوەی بیچمی جەغزئاسایە ‹قورسەی خۆر› ٢. حەب؛ حوب؛ هەب؛ گزموولەی دەرمان ‹حەبی پەتا› ٣. هەر ماکێکی کیمیاوی یان خۆراکی وەک حەب ‹قورسی نەعنا› 🇮🇷 ١تا٣. قُرص

**قورس**[2]: ئاوەڵناو. ١. سەنگین؛ بەرانبەری سووک ٢. *[مەجاز]* لەسەرەخۆ و بەحورمەت ٣. گران؛ تایبەتمەندی گوێی گران ‹گوێم قورسە، دەنگ بەرز کە!› 🇮🇷 ١. سنگین ٢. باوقار ٣. سنگین (گوش)

**قورساخ** / qursax/: ناو. قورساغ؛ سەنگینی و گرانی مرۆ ◘ وقار؛ متانت

**قورساغ** / qursağ/: ☜ **قورساخ**

**قورساق** / qursaq/: ناو. مەلاشوو؛ مەلاشک ◘ سقف دهان

**قورساندن** / qursandin/: چاوگ. حەپەساندن؛ سەرسام کردن ◘ مُتحیر کردن

**قورسایی** / qursayî/: ناو. ١. قورسی؛ سەنگینی ٢. سەنگینی مرۆ ◘ ١. وزن ٢. وقار

**قورساییگە** / qursayîge/: ناو. گرانیگا؛ خاڵی قورسایی ◘ گرانیگاه

**قورسک** / qurisk/: ناو. قورسکە؛ زیقەی سەگ لە ئێش پێ گەیشتن ◘ زوزەی سگ از درد

**قورسکان** / quriskan/: چاوگ. زیقاندنی سەگ لە ئێش پێ گەیشتن ◘ زوزه کشیدن سگ از درد

**قورسکە** / quriske/: ☜ **قورسك**

**قورسکەقورسک** / quriskequrisk/: ناو. زیقەزیقی سەگ ◘ زوزەی پیاپی سگ

**قورس‌وقۆل** / qurs û qol/: ناوەڵناو. قایم و تونـد و بەکێش ◘ محکم و سنگین

**قورس‌وقووڵ** / qurs û qûł/: ☜ **قورس‌وقەمە**

**قورس‌وقەمە** / qurs û qeme/: ناوەڵناو. قورس‌وقووڵ؛ سەنگین و گران ◘ باوقار

**قورسە** / qurse/: ناو. کەستەک؛ شیش؛ شمش؛ قولت؛ کانزای داڕێژراوەی پاڵێوراو کە بۆ گواستنەوە یان فرۆش لە ڕێژە و ئەندازەیەکی ڕەچاوکراودا دروستی دەکەن ◘ شمش

**قورسی** / qursî/: ناو. ١. قورسایی؛ سەنگینی ٢. ئەسکەمل؛ کورسی؛ سەندەڵی ٣. کورسی؛ قورسین؛ چوارپایەیێکی پان و کورت و چواربەر کە زستانان کوانووی لە ژێر دەنێن و لێفەی لە سەر دەخەن و لە ژێریدا خۆ گەرم دەکەنەوە ◘ ١. سنگینی ٢. صندلی ٣. کُرسی

**قورسیکەمەر** / qursîkemer/: ناو. گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ ◘ گیاهی دارویی

**قورسین**[١] / qursîn/: ☜ **قورنجاندن**

**قورسین**[٢]: ☜ **قورسی ـ٣**

**قورش** / qur(i)ş/: ناو. قورووش؛ وردەپووڵێکە ◘ واحد پولی است

**قورعان** / qur'an/: ☜ **قورئان**

**قورعانخوێن** / qur'anx(i)wên/: ☜ **قورئانخوێن**

**قورعە** / qur'e/: ناو. قورحە؛ قوڕە؛ پسوولەی خۆ و بەخت ◘ قُرعه

**قورعەکێشی** / qur'ekêşî/: ناو. قوڕەکێشی؛ ڤژانگ؛ ڤژاگ؛ لاتاری؛ کاری هەڵبژاردنی بەختەکی بۆ وەرگرتنی پشک ◘ قُرعه‌کشی

**قورغ** / qurğ/: ☜ **قورخ**

**قورف** / qurf/: ناو. ١. قەف و گوڵی دەغڵ ٢. کێشەوەی درواو بۆ سەر خۆیان ٣. گوڵبژێر لە پەرێز ٤. لەرە؛ لەرزە ٥. ترس؛ زراو؛ زاور ٦. پاشەڕۆکی مێوە ◘ ١. فرایند گُل دادن غله ٢. عمل جمع کردن درویده در خرمن ٣. خوشه‌چین ۴. لرزه ۵. ترس ۶. پساچین میوه

**قورفاندن** / qurfandin/: چاوگ. ١. ترسانن؛ زراو بردن ٢. لەرزاندن؛ لەراندنەوە ٣. قوڕافتن؛ هەڵپساندنی وەک گوڵی دەغڵ ◘ ١. ترساندن ٢. لرزاندن ٣. بُریدن خوشه‌ی غله

**قورفت** / qurift/: ناو. خەزێم؛ ئاڵقەی لووت بو جوانی ◘ خزام؛ حلقه‌ی زینتی بینی

**قورقرۆک** / qurq(i)rok/: ☜ **قاروتك**

**قورقورۆک** / qurqurok/: ناو. هەویردە؛ کەڕەواڵە ◘ بلدرچین

**قورقێنە** / qurqêne/: ☜ **قرقیتە**

**قورک** / qurk/: ☜ **قورپ**

**قورم** / qurm/: ناو. ١. قوتم؛ بنی داری بڕدراو ٢. بارستایی دار ٣. سیان؛ ڕەشایی نیشتووی

دووکەڵ ‹هەمیشە کە دەستم بۆ ناو کەپۆم ببردایە، قورمی ڕەشی نەفت بە دەستمەوە دەهات «هەژار، چێشتی مجێور»› ٤. لەتە هێزم؛ بڕەدارێک ٥. قرم؛ تەماح ٦. قومی ئاو ▪ ١. تە درخت بریدە ٢. قُطر درخت ٣. دودە ۴. قطعەی هیزم ۵. طمع ۶. جُرعە

▣ **قورم (لێ) خۆش کردن**: تەما تێ کردن ▪ طمع کردن (در چیزی)

**قورماتیخ** / qurmatîx/: ناو. ١. بنیڕان ٢. خالیگە ▪ ١. بیخ ران ٢. تهیگاه

**قورمچاندن** / qurm(i)çandin/: ☜ **قەرمچاندن**

**قورمسان** / qurm(i)san/: چاوگ. پسان؛ بڕیان؛ قرتیان ▪ قطع شدن

**قورمساندن** / qurm(i)sandin/: چاوگ. پساندن؛ بڕین؛ قرتاندن ▪ قطع کردن

**قورمیش** / qurmîş/: ناو. کۆک؛ کاری با دانی زەمبەلەکی سەعات بە کلیل ▪ کوک ساعت

**قورمین** / qurmîn/: چاوگ. ١. کورک بوون؛ کڕ کەوتن ٢. هەدا دان؛ دامەکنان ▪ ١. کُرچ شدن ٢. آرام گرفتن

**قورناقە** / qurnaqe/: ☜ **قوڕو**

**قورنج** / qurinc/: ناو. قورنچک؛ قورچی؛ قورنچ؛ قورینج؛ قونجڕ؛ قورنجک؛ قورینجان؛ قورینچەک؛ قوڕنیسک؛ قولینجێ؛ قونجریک؛ قوونچڕک؛ نوقرچک ▪ نیشگون

**قورنجاندن** / qurincandin/: چاوگ. قورچی کرن؛ قورسین؛ قورینجاندن؛ قوڕنیسک کرن؛ نوقرچک گرتن ▪ نیشگون گرفتن

**قورنجک** / qurincik/: ☜ **قورنج**

**قورنچ** / quriç/: ☜ **قورنج**

**قورنچک** / qurinçik/: ☜ **قورنج**

**قورنگ** / quring/: ☜ **قازیقولنگ**

**قورنیچ** / qurnîç/: ناو. کورنیشک؛ نقورچک ▪ نیشگون

**قورواق** / qurwaq/: ☜ **قربۆق**

**قوروان** / qurwan/: ☜ **قوربان**

**قوروانی** / qurwanî/: ☜ **قوربانی**

**قوروگنە** / qurug(i)ne/: ☜ **قوڕو**

**قورۆ** / quro/: ناو. قڕ؛ ئالشت؛ زوقم؛ خووس؛ خووسار ▪ پژ؛ سرماریزه

**قورۆش** / quroş/: ☜ **قرۆش**

**قورۆقە** / quroqe/: ناو. قرۆقە؛ ڕەوتی لێک بڵاو بوونی سواران بە پرتاو لە کاتی جەنگدا ▪ فرایند پراکنده شدن سواران جنگی

**قورۆقەتێ** / quroqetê/: ناو. جنێوێکە ▪ دُشنامی است

**قورۆمە** / qurome/: ناو. ئێرەقە؛ باسکی ئاموور ▪ چوب بلند خیش

**قورووسکان** / qurûskan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //قوروسکای؛ دەقرووسکێ؛ بقرووسکێ// قووزیای؛ لووراندن؛ لوورانەوە ▪ زوزه کشیدن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: قورووسکاو/ چاوگی نەرێنی: نەقرووسکان

**قورووسکاندن** / qurûskandin/: چاوگ. تێنەپەڕ. //قورووسکاندت؛ دەقرووسکێنی؛ بقرووسکێنە// قورووشکان؛ قووزنای؛ لوراندنەوە؛ نووسکاندنی سەگ لە کاتی ئازاردا ▪ زوزه کشیدن سگ

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ــــ/ چاوگی نەرێنی: نەقرووسکاندن

**قورووش** / qurûş/: ☜ **قورش**

**قورووشکان** / qurûşkan/: ☜ **قورووسکاندن**

**قورووشکە** / qurûşke/: ☜ **قوریشکە**

**قورە** / qure/: ناوەڵناو. لووتبەرز؛ بەدەعیە و دەمار ▪ مُتکبر

**قورەباچکە** / qurebaçke/: ناو. قشقەڕە؛ قشقرە؛ قشقەڵە ▪ زاغی

**قوریژن / qurîjin/**: ناو. گرمەی هەور؛ دەنگی هەور ☰ تُندر

**قوریژنک / qurîjink/**: ☜ زەنگلۆك

**قوریژنگ / qurîjing/**: ناو. زەنگلۆک؛ قورتم؛ ئەوک؛ لوولەی نێوان قورگ و گەدە ☰ مری

**قوریشکە / qurîşke/**: ناو. قورووشکە؛ جۆرێک فنجانی چینی قولفدار ☰ نوعی فنجان چینی دستەدار

**قورینج / qurînc/**: ☜ قورنج

**قورینجان / qurîncan/**: ☜ قورنج

**قورینجاندن / qurîncandin/**: ☜ قورنجاندن

**قورینچەک / qurînçek/**: ☜ قورنج

**قورینگ / qurîng/**: ☜ قازیقولنگ

**قورینگان / qurîngan/**: ناو. ئالفێکە بۆ ئاژەڵ خۆشە ☰ گیاهی علفی

**قورینگیگۆزەڵێ / qurîngîgozełê/**: ناو. شینەقورینگ ☰ دُرنا

**قوڕ / quř/**: ناو. هەڕ؛ هەڕی؛ حەڕی؛ هەڕگ؛ هەڕک؛ حەڕگ؛ خەڕگ؛ هەڕە؛ هەڕڕە؛ هوڕی؛ هوڕ؛ هەرە؛ خەڕە؛ گڵ؛ گیل؛ بشکوول؛ بشکووڵ؛ پشکووڵ؛ قیش؛ تەتن؛ گوڕ؛ موولە؛ چەل؛ تێکەڵاوی خۆڵ و ئاو ☰ گِل

⊡ **قوڕ بە سەردا کردن:** /کینایە/ خۆ لە قوڕ نان؛ قوڕ پێژان؛ تووشی کارەسات بوون ‹لە حەققی مەقدەمی حاجی قوڕی کوێ کەم بەسەر خۆما/ دڵێکم بوو لە دنیادا ئەویش بەینێکە تۆراوە «حاجی قادر»› ☰ خاک بر سر کردن

**قوڕ بە سەر کەسێکدا چوون:** /کینایە/ لە کەسێک قەومان و تووشی کارەساتی خراپ بوون ☰ خاک بر سر کسی شدن

**قوڕ بە سەردا کردن:** /کینایە/ لە بەرامبەر کارەساتێکەوە هیچ پێ نەکران و هیچ دەرەتانێک شک نەبردن ☰ خاک بر سر کردن

**قوڕ پێوان:** /کینایە/ قوڕ وە سەر کردن لە بەدبەختیان ‹عەجایب مەحشەرت هێناوە بۆ ئەم باقیماوانەت/ هەرایە، شین و قوڕپێوانە، واوەیلایە، گریانە «ئاوات»› ☰ خاک بر سر ریختن از بیچارگی

**قوڕ پێوە دان:** /کینایە/ ١. بە دوامین دەرەجە گەیشتن ٢. بە یەکجاری وێران کردن ☰ ١. به منتها درجه رسیدن ٢. یکباره نابود کردن

**قوڕ تێدان:** حەڕی پێدا ساوین ☰ گِلمالی کردن

**قوڕ دادان:** قوڕ دان؛ درز و قەڵشت گرتنی دیوار بە حەڕی ☰ درز گرفتن دیوار با گِل

**قوڕ دان:** ☜ قوڕ دادان

**قوڕ شێلان:** قوڕ گرتنەوە: ١. بەر پێ دانی قوڕ بۆ خۆش بوون ٢. /کینایە/ تووشی بەڵا و سەخڵەت بوون ☰ ١. گِل سرشتن ٢. گرفتار سختی و مصیبت شدن؛ توی هچل افتادن

**قوڕ گرتنەوە:** ☜ قوڕ شێلان

**قوڕ وەسەر (خۆ) کردن:** /کینایە/ ١. ماتەم گرتن ٢. خۆ تووشی بەڵا کردن ☰ ١. خاک بر سر کردن ٢. خود را به هَچَل انداختن

**بە قوڕ گرتن:** /کینایە/ هەڵچنین؛ کاول کردن ‹دەک بە قوڕم گرت ئەو شارە!› ☰ گِل گرفتن

**دە قوڕ گیران:** /کینایە/ گیر کردن؛ پەک کەوتن ‹ڕۆژێک تووشی شیعرێکی شێخ ڕەزا بووین و دە قوڕ گیراین! «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ پای در گل ماندن

**سەر دە قوڕێ نان:** /کینایە/ سڵسارد بوونەوە؛ مردن (وەکوو تووکێک دەگوترێ) ‹سەرت دە قوڕێ نێی! خۆ ئەوە گەڵوگونت هەموو بە دەرەوەیە، بچۆ پشت دارێک! «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ سر به زمین نهادن؛ مُردن

**کەر لە قوڕ دەرێنان:** /کینایە/ کارێکی دژوار لە پێشدا بوون ‹... من بە لەهجەی بەغدایی، ئەو بە

زاراوەی میسری، جا وەرە و کەر لە قوڕە دەربێنە! «هەژار، چێشتی مجێور» ⇐ کار مشکلی در پیش داشتن

**لە قوڕ گرتن:** ١. سواخ دان بە قوڕ ٢. *[کینایە]* لە کار خستن ⇐ ١. گِل‌مالی کردن ٢. گل گرفتن

**نانە قوڕ:** تووشی کارەساتی گەورە کردن ‹بە نەزانکاری، خۆی و ئێمەشی نایە قوڕ!› ⇐ بە هچل انداختن

**قوڕاب / qur̄ab/:** ئاوەڵناو. خۆپەسندی بەدفەڕ ⇐ خودخواه بدجنس

**قوڕابە / qur̄abe/:** ناو. ١. دەبەی سێ تا چوار لیتری مل باریک ٢. ☜ قەڕابە ⇐ ١. دبەی کوچک ٢. ☜ قەڕابە

**قوڕابی / qur̄abî/:** ☜ غوڕابی

**قوڕات / qur̄at/:** ئاوەڵناو. ١. ئەستوور؛ قایم ٢. زۆرداری زۆرکار؛ زۆربێژ * هەروەها: **قوڕاتی** ⇐ ١. کُلُفت ٢. زورگو

**قوڕاچکە / qur̄açke/:** ☜ قوڕقوڕاگە

**قوڕاد / qur̄ad/:** ناو. بەربەسێل ⇐ آش گوشت و ماست

**قوڕادە[1] / qur̄ade/:** ☜ قوڕاڵە

**قوڕادە[2]:** ئاوەڵناو. پێگەیشتوو ‹قوڕادە پیاز› ⇐ رسیده

**قوڕازە / qur̄aze/:** ئاوەڵناو. چەپرەک؛ سەقەت؛ چەپلەک؛ لەکارکەوتوو ⇐ قُراضه

**قوڕافتن / qur̄aftin/:** چاوگ. ١. داهاتی مەزرا کۆ کردنەوە ٢. لە ڕیشە هەڵکەندن (وەک: توور و گێزەر) ٣. ڕنین (وەک: تریێ) ٤. بڕین (وەک: گوڵی دانەوێڵە) ٥. زەوی وشک و ڕەق کردنە قوڕاوی بۆ کێڵان ⇐ ١. برداشت کردن از محصول ٢. از ریشه کندن (مانند: هویج) ٣. چیدن (مانند: انگور) ٤. بُریدن (مانند: گُل غله) ۵. زمین را گل کردن برای کشت

**قوڕاق / qur̄aq/:** ☜ قربۆق

**قوڕاگە / qur̄age/:** ☜ قوڕقوڕاگە

**قوڕاڵە / qur̄ałe/:** ناو. قوڕادە؛ قوڕۆڵە؛ کوڕادە ⇐ ترەی کوهی

**قوڕان / qur̄an/:** چاوگ. فڕ کردن؛ نیانە سەرەوە ⇐ سرکشیدن

**قوڕانیک / qur̄anîk/:** ناو. ئەنیشک؛ ئانیشک ⇐ آرنج

**قوڕاو / qur̄aw/:** ناو. ١. زلیتاو؛ جلیتاو ٢. ئاوی لێڵ ٣. قوڕاد؛ بەربەسێل ⇐ ١. لجن ٢. آب گل‌آلود ٣. آش ماست و گوشت

**قوڕاوی / qur̄awî/:** ئاوەڵناو. هەڕگین؛ حەڕی پێوە نووساو ⇐ گل‌آلود

**قوڕاویلکە / qur̄awîlke/:** ناو. ١. ئاوڕۆشنکەرە؛ ئاوەڕوونکە؛ مێروویەکە بە سەر ئاودا دەفڕێ ٢. ☜ قوڕاویلە ⇐ ١. دبیب؛ حشرەای است ٢. ☜ قوڕاویلە

**قوڕاویلە / qur̄awîle/:** ناو. قوڕاویلکە؛ خێزانە باڵندەیەکە لە تۆرەمەی شێلاقە، چەن جۆری بچووک و گەورە، ناوینە و تاقی هەیە ⇐ پرندەی پاشلک

**قوڕباج / qur̄bac/:** ناو. قامچی؛ شەلاخ ⇐ تازیانە

**قوڕباجە / qur̄bace/:** ناو. خەرزەک؛ خەندخەندوک؛ لارنژیت ⇐ بیماری خروسک

**قوڕبۆق / qur̄boq/:** ☜ قربۆق

**قوڕبەست / qur̄best/:** ناو. قوڕپەست؛ پێخوێ لە قوڕ ⇐ تودەی کاهگل

**قوڕبەسەر / qur̄beser/:** ئاوەڵناو. *[کینایە]* قوڕوەسەر؛ خاکسەر؛ هەرگوەسەر؛ بێچارە ‹چ حالە! قوڕبەسەر حەتتا بە حالم پێکەنینی دێ/ بە دەست ئەتواری تووە قوڕبەسەر خۆم، ئەی دڵەی بەدخوو! «مەحوی»› ⇐ خاک بر سر؛ بدبخت

**قوڕبەسەری / qur̄beserî/:** ناو. *[کینایە]* قوڕوەسەری؛ بەدبەختی ⇐ بیچارگی؛ بدبختی

**قوڕپەست** / qur̄pest/: ☜ **قوڕبەست**

**قوڕڕە** / qur̄r̄e/: ناو. ئاوقۆرە؛ بەرسیلە؛ پەسیلە ☰ آبغوره

**قوڕش** / qur̄ş/: ناو. تەشق؛ عەرش؛ کەشکەڵان؛ تەشقی ئاسمان ☰ عرش

**قوڕشێل**[1] / qur̄şêl/: ناو. کەسێ کە حەڕێ بە پا خۆش دەکا ☰ گِل‌سرشت

**قوڕشێل**[2]: ناوەلناو. /کینایە/ ناهەمێ؛ کەساس ☰ بیچاره

**قوڕقوڕاچکە** / qur̄qur̄açke/: ☜ **قوڕقوڕاگە**

**قوڕقوڕاچگە** / qur̄qur̄açge/: ☜ **قوڕقوڕاگە**

**قوڕقوڕاگە** / qur̄qur̄age/: ناو. قرقرۆچکە؛ قرقراگە؛ قرقراچکە؛ قوراگە؛ قوڕقوڕاچکە؛ قوڕقوڕاچگە؛ قوڕاچکە؛ قوڕقوڕانچک؛ قوڕقوڕاوکە؛ قوڕقوڕۆچکە ☰ خِرخِره

**قوڕقوڕانچک** / qur̄qur̄ançik/: ☜ **قوڕقوڕاگە**

**قوڕقوڕاوکە** / qur̄qur̄awke/: ☜ **قوڕقوڕاگە**

**قوڕقوڕبەگ** / qur̄qur̄beg/: ناو. زاوت؛ گزیر و کاربەدەستی ئاغا ☰ مُباشر؛ کارگزار ارباب

**قوڕقوڕۆچکە** / qur̄qur̄oçke/: ☜ **قوڕقوڕاگە**

**قوڕقوشم** / qur̄quşm/: ناو. سورب؛ سرپ؛ مز؛ توخمی کیمیاوی کانزایی کە نەرم و چەکوچخۆر و بۆرە ☰ فلز سُرب

**قوڕقێنە** / qur̄qêne/: ☜ **قرقێنە**

**قوڕکێش** / qur̄kêş/: ناو. ١. ناوە؛ ئامرازێکە بۆ قوڕ کێشان بە دوو کەس دە کار دەهێنرێ ٢. پاڵەی قوڕ کێشان ☰ ١. ناوەی گِل‌کشی ٢. عملەی گِل‌کش

**قوڕگ** / qur̄(i)g/: ☜ **قوڕو**

**قوڕگدڕاو** / qur̄(i)gd(i)r̄aw/: ناوەلناو. /کینایە/ ١. زۆرخۆر؛ فرەخوەر ٢. چەنەباز؛ چەقەسرۆ؛ هەڵەوەڕ ☰ ١. پُرخور ٢. پُرچانه

**قوڕمساخ** / qur̄imsax/: ☜ **قوڕمساغ**

**قوڕمساغ** / qur̄imsağ/: ناو. قوڕمساخ؛ قوڕمساق؛ دەویت؛ گەواد ‹لە سەر و سوورەتی عەجەب ماوم/ ئەم قوڕمساغە گەماڵ یا دێلە«شێخ ڕەزا»› ☰ جاکش

**قوڕمساق** / qur̄imsaq/: ☜ **قوڕمساغ**

**قوڕمسان** / qur̄m(i)san/: چاوگ. قوڕمسین؛ هەڵقرچان؛ هەڵچرچان؛ چرچ و لۆچ بوون لە بەر گوشار ☰ چروک شدن از فشار

**قوڕمساندن** / qur̄m(i)sandin/: چاوگ. ترنجانن؛ هەڵقرچاندن ☰ چروکاندن

**قوڕمسین** / qur̄m(i)sîn/: ☜ **قوڕمسان**

**قوڕناوێلکە** / qur̄nawîlke/: ناو. جۆرێ بۆقی چکۆلە ☰ نوعی قورباغەی کوچک

**قوڕنو** / qur̄nû/: ☜ **قرنو**

**قوڕنوش** / qur̄nûş/: ناو. تەنگە؛ تەنگەڵان ☰ تنگه

**قوڕنە** / qur̄ne/: ناو. ١. سووچ؛ قوژبن؛ سیلە؛ لاپاڵی دیوار ٢. لا؛ ئالی ٣. پارچەبەژێ گەورە لە دنیادا ٤. خەزێنە؛ جۆرنەی حەمام؛ حەوزۆکەی بەربەلووعە لە حەمامدا ☰ ١. گوشه؛ نبش دیوار ٢. طرف؛ سو ٣. قاره ۴. حوضچه مانند حمام

**قوڕنەت** / qur̄net/: ناو. ١. قوڕنە؛ سیلە؛ سووچ و قوژبن ٢. ئاژەڵێ کە بەچکەی نامۆ شیر دەدا ☰ ١. زاویه؛ گوشه ٢. دامی که بچەی غیر خودش را شیر می‌دهد

**قوڕنیسک** / qur̄nîsk/: ☜ **قورنج**

☐ **قوڕنیسک کرن**: ☜ **قورنجاندن**

**قوڕواق** / qur̄waq/: ☜ **قرپۆق**

**قوڕوتگ** / qur̄utig/: ☜ **قوڕو**

**قوڕوقەپ** / qur̄ û qep/: ☜ **قڕوقپ**

**قوڕوقەپۆز** / qur̄ û qepoz/: ☜ **قڕوقەپۆز**

**قوڕوگ** / qur̄ug/: ☜ **قوڕو**

**قوڕوسەر** / qur̄weser/: ☜ **قوڕبەسەر**

**قوڕوسەری** / qur̄weserî/: ☜ **قوڕبەسەری**

**قوڕۆک** / qur̄ok/: ناو. فێڵ؛ تەڵەکە ☰ نیرنگ

**قوڕۆڵ / quřoł/:** ☜ **قلۆر**

**قوڕۆڵە / quřołe/:** ☜ **قوڕاڵە**

**قـوڕوو / quřû/:** نـاو. قـرگ؛ قوڕوتـگ؛ قـوڕووگ؛ قوڕێ؛ قوڕی؛ قوڕیتگ؛ قورناقە؛ قوروگنە؛ قـوڕگ؛ قوڕوگ؛ گەروو؛ ژوورەوەی ئەستۆ لـە پێشـەوە ☰ گلو

⊡ **چوونـە قـوڕووی کەسێکدا:** *[کینایـە]* چوونــە گــژ کەسـێکدا؛ لـێ تونـد بـوون ‹وا چـووە قـوڕووی بەرێوەبەردا، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا!› ☰ نهیب زدن بر کسی

**قوڕووگ / quřûg/:** ☜ **قوڕوو**

**قوڕە / quře/:** ☜ **قورعە**

**قوڕەبان / quřeban/:** ناو. بانەناو ☰ گل‌اندود بام

**قوڕەبەشـە / quřebeşe/:** نـــاو. قەورپشـــــکنەک؛ قەورکەنە ☰ گورکن

**قوڕەچەورە / quřeçewre/:** ناو. جـۆرێ قـوڕ کـە وەک مۆم دەچێ و لە پیشەسازیدا بە کار دەچـێ ☰ نوعی گِل موم مانند

**قوڕەڕەش / quřeřeş/:** ☜ **قوڕەڕەشە**

**قوڕەڕەشە / quřeřeşe/:** ناو. قوڕەڕەش؛ جۆرێ قـوڕ کە بەنی پێ ڕەش دەکەن ☰ گِل سیاه رنگرزی

**قوڕەزێلاقە / quřezêlaqe/:** ناو. ئەو قـوڕەی دوای باران بە کەوشەوە دەنووسێ ☰ گل چسبناک

**قوڕەسواخ / quřes(i)wax/:** ناو. کـاری سـواخ دان بە قوڕ ☰ گل‌اندودکاری

**قوڕەسوورە / quřesûre/:** ناو. قوڕی خاکەسـوورە ☰ گِل خاک رُس

**قوڕەکـــاری / quřekarî/:** نـــــاو. هــــــەڕەکاری؛ هەڕگ‌کاری: ١. *[کینایە]* خانوو دروست کـردن ٢. کــار و پیشـــەی کرێکـــاری ســـاختمانی ☰ ١. خانەسازی ٢. کارگری ساختمان

**قوڕەکێشی / quřekêşî/:** ☜ **قورعەکێشی**

**قوڕەڵان / quřełan/:** ناو. باتلاخ؛ زەلکاو ☰ باتلاق

**قوڕی / quřî/:** ☜ **قوڕوو**

**قوڕیتگ / quřîtig/:** ☜ **قوڕوو**

**قـوڕین / quřîn/:** ئاوەڵـناو. دروسـت‌کـراو لـە قـوڕ؛ چێکری ژ حەڕی ‹خانووی قوڕین› ☰ گلین

**قوڕێ / quřê/:** ☜ **قوڕوو**

**قـوز / quz/:** نـاو. *[شـوورەیی]* قـوس؛ زێ؛ خەمشـە؛ ئەندامی دەرەکی زاوزێی مێ ☰ کُس؛ آلت تناسلی زن

**قوزبڕکـە / quzbiřke/:** نـاو. قوزگــەزک؛ جۆبــڕ؛ جۆبڕکە؛ ملە ☰ آبدُزدک

**قوزبزنە / quzbizne/:** ☜ **قوزەبزنە**

**قوزکـەش / quzkeş/:** نـاو. *[ناشـیرین]* ١. گــەواد؛ دەویـــت ٢. *[کینایـە]* پیـــاوی زمـــان‌لووســـی مەرایی‌کەری دووڕوو ☰ ١. جاکش ٢. مرد ریاکار

**قوزگەزک / quzgezik/:** ☜ **قوزبڕکە**

**قوزڵقورت / quziłqurt/:** ☜ **قوزوڵقورت**

**قوزڵقورد / quziłqord/:** ☜ **قوزوڵقورت**

**قوزمیت / quzmît/:** ئاوەڵـناو. ژنانیلـە؛ ئاغـەباجی (جوێنێکە) ☰ قُزمیت

**قوزوڵقـــورت / quzułqurt/:** نـــاو. قزڵـــــقورت؛ قزڵـقورت؛ قزەڵـقورت؛ قوزڵـقورت؛ قوزڵـقورد؛ قوزەڵـــقورت: ١. جوێنێکـــە ٢. کرمـــی گیابـــڕ؛ کرمێکی ژەهراوی دژی ئاژەڵە ☰ ١. کوفتِ کـاری ٢. کرمی سمی برای دام

**قوزوڵقورد / quzułqurd/:** ☜ **قوزوڵقورت**

**قـوزە / quze/:** ئاوەڵـناو. *[پلار]* قـزە؛ ترسـەنوک ☰ بُزدل

**قوزەبزنە / quzebizne/:** ناو. قوزەبزە؛ کاری خیـز لە بن گل دەرکیشان بـە زمـان لـە بازەڵـێندا ☰ عمل با زبان شن از خاک درآوردن، در بازی بچەها

**قوزەبزە / quzeb(i)ze/:** ☜ **قوزەبزنە**

**قوزەســوتەکێ / quzesûtekê/:** نـــاو. *[شـــوورەیی]* جۆرێ نەخۆشی کچۆلەی ساوایە ☰ نوعی بیماری

دختران نوزاد

**قوزەکەمتیار** / quzekemt(i)yar/: ناو. [کینایە] هۆی فریودان و خەڵەتاندن ‹کابرا قوزەکەمتیاری پێ بوو، هەموومانی فریو دا!› ☰ وسیلەی فریب

**قوزەڵقورت** / quzełqurt/: ☜ قوزوڵقورت

**قوژباشی** / qujbaşî/: ناو. پـل؛ پـەل؛ تکـە؛ تککـە؛ چنچک ☰ چنجه

**قـوژبن** / qujbin/: نـاو. قـوچبن؛ کـوژبن؛ سـووچ؛ گۆشه ☰ گوشه؛ زاویه

**قوژپێنە** / qujpêne/: ☜ قرقێتە

**قوژمرین** / qujm(i)rîn/: چاوگ. چرچ و لۆچ پەیدا بوون لە ڕوخسار ☰ چین و چروک افتادن در صورت

**قوس** / qus/: ناو. ١. ☜ قـوز ٢. کـاری تاشـینی موو ٣. جۆرێ سـتورک؛ چەشـنێ کـولێرە ☰ ١. ☜ قوز ٢. عمل تراشیدن مو ٣. نوعی گردەنان

**قوسان** / qusan/: چاوگ. ١. تاشران؛ تراشـیان ٢. بلۆق کردنی پا لـە بـەر ڕێگـە چـوونی زۆر ☰ ١. تراشیده شدن ٢. تاول زدن پا

**قوساندن** / qusandin/: چاوگ. ١. تاشین؛ تراشین ٢. بـڕین بـە تیـغ ٣. قـاچ پەنەمانـدن لـە بـەر ماندوویی ☰ ١. تراشیدن ٢. بُریدن ٣. متـورم کـردن پا

**قوسسان** / qussan/: چاوگ. قەسسان: ١. تاشرانی موو ٢. ئاوسان؛ پەنەمان و کـوتران ☰ ١. تراشـیده شدن مو ٢. آماسیدن

**قوسور** / qusûr/: ☜ قسوور

**قوسیای** / qusyay/: ئاوەڵناو. ١. هەڵچوو (شـیر) ٢. بلۆق‌کردوو (پا) ☰ ١. سررفته (شیر) ٢. تاول‌زده (پا)

**قوسین** / qusîn/: چاوگ. ١. هەڵـچوون (شـیر) ٢. پەنەمان و بلۆق کردن (پا) ☰ ١. سر رفتن (شیر) ٢. ورم کردن و تاول زدن (پا)

**قوش** / quş/: ناو. ١. خۆیانی گێرەنەکراو؛ کلۆشـی ئامـادەی کوتـان ٢. باڵـندەی ڕاوکـەر ٣. ☜ قوشقن ـ١ ☰ ١. خرمن نکوبیده ٢. پرندەی شکاری ٣. ☜ قوشقن ـ١

**قوشچی** / quşçî/: نـاو. بـازەوان؛ بازپـەڕێن؛ ئـەو کەسـەی لـە ڕاوەبـازدا، بـاز بـەرەو نـێچیر هەڵدەفڕێنێ ☰ قوشچی

**قوشقانە** / quşqane/: ☜ قابلەمە ـ١

**قوشـقن** / quşqin/: نـاو. ١. قـوش؛ قوشـقنە؛ قوشقونە؛ پاڵوو ٢. کاری ڕووتاندنەوەی پەلەوەری سەربڕاو ☰ ١. پاردُم زین اسب ٢. آبروت

▣ **قوشقن کردن:** پەڕ و تووک لـێ کردنـەوە؛ پـاک کردنی پەلەوەری سەربڕاو ☰ آبروت کردن

**قوشقنە** / quşq(i)ne/: ☜ قوشقن ـ١

**قوشقون** / quşqun/: نـاو. بـن‌پـزوو؛ پاڵـوێنی بـن کلکی وڵاخی سواری ☰ پاردُم

**قوشقونە** / quşqune/: ☜ قوشقن ـ١

**قوشـقی** / quşqî/: ئاوەڵـناو. ١. سـڵ؛ ڕەوەک ٢. تووڕە؛ وەڕەز ☰ ١. رموک ٢. عصبانی

**قوشقیەتی** / quşq(i)yetî/: ناو. سلم؛ ڕەو ☰ رم

**قوففە** / quffe/: ☜ قوفە

**قوفل** / qufl/: ناو. ١. ☜ قفـڵ ٢. قـوفل؛ سـڕی؛ تەزی سـەرما ☰ ١. ☜ قفـڵ ٢. کرختـی از سـوز سرما

**قوفلک** / quflik/: ناو. دەستبەندی ژنان بۆ جـوانی ☰ دستبند زینتی

**قوفلین** / quflîn/: ☜ قەڕسان

**قوفڵ** / quft/: ناو. ١. ☜ قفـڵ ٢. قوفـل؛ سـڕی؛ تەزی سـەرما ☰ ١. ☜ قفـڵ ٢. کرختـی از سـوز سرما

**قوفڵکردنی** / quf(i)łkird(i)nî/: ☜ قوڵفی

**قوفڵەگرێ** / qufłeg(i)rê/: ناو. سـندم؛ قوفڵـەگرێ ☰ گره

**قوفڵی** / qufłî/: ☜ قوڵفی

**قوفە** / qufe/: نـاو. قوففـە: ١. کـەرەجی؛ جـۆرە

بەلەمێکی لادیوار بلندە ٢. کۆخە؛ قۆزە ☰ ١. کرجی ٢. سُرفە

**قوفین / qufîn/**: ☜ **قفین**

**قوقان / quqan/**: ☜ **قوقاندن**

**قوقاندن / quqandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //قوقاندت؛ دەقوقێنی؛ بقوقێنە// قوقانن؛ قوقان؛ دەنگ هەڵبڕینی کەڵەشێر ☰ بانگ سر دادن خروس

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەقوقاندن

**قوقانن / quqanin/**: ☜ **قوقاندن**

**قوقو / ququ/**: دەنگەناو. دەنگی کەڵەشێر ☰ صدای خروس

**قول / qul/**: ناو. ١. باریکایی بەلەک ‹قولی ڕەش و سپی لە بوارا دەرئەکەوێ «مەسەل»› ٢. ☜ **قولانج** ٣. لەپ و ناومشت ٤. پڕ بە نێوان قامکی گەورە و قامکی شادە لە گوڵ و گیا ‹دوو قول ڕێواسم بەرێ!› ٥. قلێل؛ کون؛ کونا ٦. وشەیەکە لە یاری هەلووکێندا ٧. ڕەشپێست ٨. کۆیلە؛ بەنی ☰ ١. ساق پا ٢. ☜ **قولانج** ٣. کف دست ۴. دسته گل یا گیاه پر دو انگشت شست و سبابه ۵. سوراخ ۶ اصطلاحی در بازی الک‌دولک ۷. سیاه‌پوست ۸ برده

◙ **قولی مست**: ناو لەپ ☰ کف دست

◙ **قول بوون**: کونا بوون ☰ سوراخ شدن

**قول لە قول جیا نەکردنەوە**: *[کینایە]* هیچ نەزانین؛ تەقەی سەر هاتن ☰ سیاه از سفید نشناختن

**با کردنە قول کەسێ**: *[مەجاز]* تیژ کردنەوە؛ هەڵنان ☰ هندوانه زیر بغل کسی دادن

**نەگەینە قول کەسێکا**: *[کینایە]* ١. لە ڕێگا چوون یان ڕاکردندا هاوپای کەسێک نەبوون ٢. لە حاندی کەسێکدا نەبوون ☰ ١. در راه رفتن یا دویدن حریف کسی نشدن ٢. همپای کسی نبودن

**قولاب / qulab/**: ناو. قولاپ؛ قولاپە؛ قولاو؛ نهک؛ نەق؛ کولاب: ١. کەرەسەیێ سەرچەماو بۆ: *ئ)* ماسی گرتن *ب)* دروومان و چنین (کاموا، تەل و ...) *ج)* گرتن، کێشان، هەڵواسین (چنگاڵ، چەنگەک، چەنگل) ٢. نیشانەی کرۆشە: [ ] ☰ ١و٢. قُلاب

**قولابدۆزی / qulabdozî/**: ناو. قولاپدووری؛ جۆرێ گوڵدووری بە بەنی هەوریشمی ☰ قُلاب‌دوزی

**قولاپ / qulap/**: ☜ **قولاپە**

**قولاپاندن / qulapandin/**: چاوگ. پەژیوان کردنەوە ☰ پشیمان کردن

**قولاپدووری / qulapdûrî/**: ☜ **قولابدۆزی**

**قولاپە / qulape/**: ناو. قولاپ: ١. قولاب؛ قولاو؛ نهک ٢. قیتک؛ گرچک؛ چوو؛ کۆندیل؛ زۆپی هێلکەئاسای سەری ئێسک کە دەکەوێتە نێو قووڵایی پێشەیترەوە ٣. گوێزنگ؛ قونیک؛ قولەپێ؛ قولەفیسکە؛ زەنگوو؛ کاب؛ هوویرک؛ هەرکام لەو دوو دەرپەڕیوەی دوو شانی جومگەی پێ ☰ ١. قُلاب ٢. سر استخوان ٣. قوزک پا

**قولاج / qulac/**: ☜ **قولانج**

**قولاچە / qulaçe/**: ☜ **قالۆنچە**

**قولان / qulan/**: ناو. ١. قولانی؛ کار و دۆخی بە هەنگڵەشەلە ڕۆیشتن ٢. جۆرێ گەمەی کوڕانەی دووپۆلی ☰ ١. لی ـ لی رفتن ٢. نوعی بازی تیمی

**قولانج / qulanc/**: ناو. قولاج؛ قۆلاج؛ قۆلاچ؛ قول؛ قولانچ؛ گوێل؛ درێژایی نێوان قامکی زل و قامکی شادە بە ئاواڵەیی ‹مێژوو هات و بالای خۆی گرت/ بە بالای زامەکانی تۆ/ زامەکانت/ یەک دوو قولانج درێژتر بوون «شێرکۆ»› ☰ باژ

**قولانچ / qulanç/**: ☜ **قولانج**

**قولانچە / qulançe/**: ☜ **قالۆنچە**

**قولانچەژارە / qulançejare/**: ☜ **قۆلانچەژارە**

**قولانچەنەخشینە / qulançenexşîne/**: ☜ **قۆلانچەژارە**

**قولانی** / qulanî/: ☜ **قولان ـ١**

**قولاو** / qulaw/: ☜ **قولاب**

**قولپاندن** / qulpandin/: چاوگ. قولپاندن: ١. وەرگەڕاندن؛ قلپ کردنەوە ٢. قولاپاندن؛ پەژیوان کردنەوە ▣ ١. واژگون کردن ٢. پشیمان کردن

**قولپک** / qulpik/: ☜ **قرقیتە**

**قولتەشە** / qulteşe/: ☜ **قولتەشە**

**قولتیک** / qultîk/: ناو. کاڵەکی زەرد؛ جۆرێ گندۆرەی زەرد ▣ نوعی خربزە

**قولچماغ** / qulç(i)mağ/: ئاوەڵناو. ١. قسەخۆش؛ حەنەکچی ٢. قاڵتاغ؛ تەڵەکەباز؛ درۆزنی چەورزمان ▣ ١. لودە؛ شوخ ٢. قالتاق

**قولزاندن** / qulzandin/: چاوگ. چەماندنەوە؛ داهێنانەوە ▣ خم کردن

**قولزین** / qulzîn/: چاوگ. چەمانەوە؛ داهاتنەوە ▣ خم شدن

**قولغ** / qul(i)ğ/: ئاوەڵناو. ڕند؛ جوان و بەرچاو ▣ خوش‌ترکیب

**قولف** / qulf/: ☜ **قوڵف**

**قولفدار** / qulfdar/: ئاوەڵناو. دەسکدار؛ بەدەسک؛ بەهەنگل ▣ دستەدار

**قولفین** / qulfîn/: چاوگ. سڕ بوون لە سەرمان ▣ کرخت شدن از سرما

**قولقولامل** / qulqulamil/: ناو. بەندی شان و مل؛ جەمسەری شان و قۆل ▣ میان شانە و گردن

**قولقولان** / qulqulan/: ناو. قولیقولی؛ جۆرێ کایەی زارۆکان ▣ نوعی بازی کودکان

**قولقولانچکە** / qulqulançke/: ناو. قولقولانە؛ ئالقەی ئەستوور لە تێکوڵەدار و پەڕۆ، بۆ بنەدێزە و سەری حەمباڵان ▣ حلقەی تیوب مانندی کە حمالان بر سر می‌گذارند

**قولقولانە** / qulqulane/: ☜ **قولقولانچکە**

**قوللە** / qulle/: ناو. ١. ترۆپکی چیا ‹شاخ بۆ زەڕرین‌کۆ، قوللەی خورمادار/ سەیر مەهرەوان ویەرد عومەریار «موحەممەدئاغای زەنگەنە»› ٢. بڕج؛ خانووی خڕ و بڵند بۆ سەنگەر ‹قوللەی قەڵای دڵ نەگرتە بی تەم/ ڕەوشەن بیم چوون جام جەهان‌نمای جەم «میرزا شەفیع پاوەیی»› ٣. چکۆ؛ کولە؛ کوللە ٤. قوڵقوڵە؛ سەرچاوەی گەورەی ئاو کە بە زۆری ئاوی لێ هەڵدەقوڵێ ٥. دەسک و هەنگلی دەفر ▣ ١. قُلەی کوە ٢. بُرج؛ قلعە ٣. ملخ ٤. سرچشمەی بزرگ آب جوشان ٥. دستەی ظرف

▣ **قوللەی قاف** [کنایە] قولەی قاف؛ شوێنی هەرەبەرز کە دەستی کەسی پێ ناگا ‹خزمینە مەدەن پەنجە لەگەڵ عەشرەتی جافا/ مێروولە نەچێ چاکە بە گژ قوللەیی قافا «شێخ ڕەزا»› ▣ قُلەی قاف

**قولمە** / qulme/: ناو. مەشکەدڕە؛ سیسرکی ڕەش ▣ جیرجیرک سیاه

**قولنج** / qulinc/: ☜ **کوڵنج**[1]

**قولنچک** / qulinçik/: ناو. قولینچک؛ قونیچ؛ کولینچک: ١. سووچ؛ قوژبن ٢. تووتە؛ قامکەچکۆلە ▣ ١. گوشە ٢. انگشت کوچک

**قولند** / qulind/: ناو. ١. کدو؛ کوولەکە ٢. گیایەکە بۆ ڕازاندنەوەی نێو ماڵان ▣ ١. کدو ٢. گیاهی آپارتمانی

**قولنگ** / quling/: ☜ **قازیقولنگ**

**قولنگۆ** / qulingo/: ناو. هەوایەکی بەناوبانگە بۆ مردوو لاواندنەوەی دەخوێنن ▣ آهنگی مرثیەای

**قولنگە** / qulinge/: ☜ **قوڵنگە**

**قولوج** / quluc/: ☜ **قولوچ**

**قولوجان** / qulucan/: ناو. قولوجانێ؛ قولوچان؛ قولوچانی؛ ماتێن؛ ماتان؛ مێشان؛ چاڵان؛ پلان ▣ بازی تیلە بە گو

**قولوجانێ** / qulucanê/: ☜ **قولوجان**

**قولوچ** / quluç/: ناو. قولوج: ١. مات؛ کەلا؛ کەللا؛

قولکەی چکۆلە بۆ کایەی کـەلایێن ٢. قولـکەی پچووک ☰ ١. گو تیلەبازی ٢. چالەی کوچک

**قولوچان** / quluçan/: ☜ **قولوجان**

**قولوچانی** / quluçanî/: ☜ **قولوجان**

**قولوچ ـ قولوچ** / quluç quluç/: ئاوەڵناو. قـولیچ ـ قولیچ؛ پڕ لە قولکە و چاڵ ☰ چالەچولە

**قولوقاچ** / qul û qaç/: ☜ **قاچوقول**

**قولون** / qulun/: ☜ **قلیان ـ١**

**قولۆخە** / quloxe/: ناو. قولەغە؛ کەوچێز؛کشـتێل ☰ ملاقه

**قولۆر**[١] / qulor/: ☜ **قلۆر**

**قولـۆر**[٢]: ئاوەڵناو. ١. ناوقوولـی لێوهەڵـگەڕاوە ٢. نارێک؛ نـاقۆلا ☰ ١. مُقعر لـب‌برگشـته ٢. زُمُخـت؛ ناهموار

**قولۆز** / quloz/: ناو. قەڵەمباز؛ بازی توند ☰ پـرش بُلند

**قولـۆق** / quloq/: نـاو. قنچکـــی زوڕات؛ دووی گەنمەشامی ☰ دُنبالچەی بلال

**قولوز** / qulûz/: ئاوەڵناو. پشت‌کووڕ؛ پشت‌چەمیاو ☰ کوژپشت

**قولولو** / qulûlû/: نـاو. چاوشارەکێ؛ قەراـقەرا ☰ قایم‌موشک

**قولولولو** / qulûlûlû/: نـاو. چاوشـارکێ ☰ قـایم باشک

**قوله** / qule/: ناو. ١. ترۆپکی چیـا ‹بـە قولەکـەی شاهۆ ئاوێزانم کەن/ تێکـەڵ وە بـاڵای نـازارانم کـەن «فولکلـۆر»› ٢. قـولله؛ بـرج ٣. ئەسـپی ڕەش ٤. بارگیری نارەسن ٥. بزنەمووی ڕەنگ‌سپات ☰ ١. قُله ٢. بُرج ٣. اسب سیاه ۴. یابو ۵. تیره‌ای از بز

▣ **قولەی قاف** ☜ **قوللەی قاف**

**قولەبازەڵە** / qulebazeŀe/: ☜ **قشقەرە ـ١**

**قولەبانک** / qulebanik/: نـاو. هـەورەبان؛ کۆمـاج؛ ئۆدەی سەربان بۆ ئەسـپاب لـێ دانـان ☰ اتاقـک پشت‌بام

**قولەپا** / qulepa/: ☜ **قولەپێ**

**قولەپسکێ** / qulepiskê/: نـاو. کـاری شلەشـــل ڕۆیشتن ☰ عمل سلانه ـ سلانه راه رفتن

**قولەپە** / qulepe/: ☜ **قولەپێ**

**قولەپەی** / qulepey/: ☜ **قولەپێ**

**قولەپێ** / qulepê/: ناو. قولەپە؛ قولـەپا؛ قولەپـەی؛ بەلەک؛ پووز؛ قاچ ☰ ساق پا

**قولەتێن** / quletên/: ناو.[شەرع] ئاوێ کە قووڵی و چوار گۆشەی تا ئانیشکە ☰ قُلّتین؛ آب پاک شرعی

**قولـەڕەش** / quleřeş/: نـاو.[پـلار] قولەڕەشـــە؛ قولەزەنگی؛ مرۆی ڕەش‌پێست ☰ کاکاسیاه

**قولەڕەشە** / quleřeşe/: ☜ **قولەڕەش**

**قولەزەنگی** / qulezengî/: ☜ **قولەڕەش**

**قولەفیسکە** / qulefîske/: ناو. ١. ڕەفیسکە؛ ڕەگی بن ئەژنۆ ٢. قولەپێ ☰ ١. رگ زیر زانو ٢. قوزک پا

**قولەقاپە** / quleqape/: ☜ **قولەپێ**

▣ **بە قولەقاپەی (کەسێ) نەگەیشتن**:[کینایە] تـۆز (ی‌کەسـێ) نەتەقانـدن؛ بـە تـۆز (ی‌کەسـێکدا) نەگەیشتن ‹دەس‌ڕەنگینێکە، لـە خـاکی ڕەشـی نـمناک، سکەیەکی وای داڕشتووە کە بـە هـەزاران هەزار، بە بار و بە خەڵوار، مرواری و گەوهەر ... بـە قولەقاپەی ڕاناگەن ... «هەژار، *شەرەفنامە*»› ☰ بە گرد پا(ی کسی) هم نرسیدن

**قولەقاچ** / quleqaç/: ناو. جومگەی پا؛ پشت قاپی پێ ☰ مُچ پا

**قولـەکـانێ** / qulekanê/: نـاو. کـــولی‌کـــولی؛ هەنگڵەشەلە؛ لنگەشەلێ ☰ لَی ـ لَی

**قولەکە** / quleke/: ناو. دەخڵ؛ دەغیلە ☰ قُلّک

**قولەگ** / quleg/: ناو. گیایەکە ☰ گیاهی است

**قولەمست** / qulemist/: نـاو. ناوپەنجـە؛ ناولـەپ ☰ کف دست

**قولەمشـــتێ** / qulemiştê/: نـــاو. پشـــــکیلان؛

کەڵەمستێ 🇮🇷 از سرگرمی‌ها

**قولەمشک** / qulemişk/: ناو. سیلامیش؛ کونەمشک 🇮🇷 سوراخ موش

**قولهە** / qulhe/: ناو. نێوان؛ تێغە؛ باریکەدیواری بەینی دوو ژوور 🇮🇷 تیغه

**قولهەڵکراو** / qulheɫk(i)raw/: ☜ **قولهەڵماڵراو**

**قولهەڵماڵراو** / qulheɫmaɫraw/: ئاوەڵناو. قولهەڵکراو: ١. دەلینگ‌هەڵپێچراو ٢. /کنایە/ زرنگ و ئامادەی کار 🇮🇷 ١. پاچەورمالیده ٢. زرنگ و آمادەی کار

**قولی** / qulî/: ناو. ١. شان؛ شان‌ومل ٢. کون؛ کونا 🇮🇷 ١. شانه (بدن) ٢. سوراخ

⊡ **قولی کرن:** کون کردن 🇮🇷 سوراخ کردن

**قولیان** / qulyan/: ☜ **کوڵان**

**قولیچک** / qulîçik/: ناو. سەرشان؛ قەلادووشان 🇮🇷 بالای شانه

**قولیز** / qulîz/: ناو. کڕنووش؛ کاری داهاتنەوە؛ چەمینەوە 🇮🇷 کُرنش؛ عمل خم شدن

**قولیک** / qulîk/: ناو. زیندان؛ گرتووخانە؛ بەندیخانە 🇮🇷 زندان

**قولیلک** / qulîlik/: ناو. کون؛ کونا؛ قول 🇮🇷 سوراخ

**قولینج** / qulînc/: ناو. کونچک؛ کونج؛ سووچ 🇮🇷 گوشه؛ زاویه

**قولینجێ** / qulîncê/: ☜ **قورنج**

**قولینچک** / qulînçik/: ☜ **قولنچك**

**قولینچکدار** / qulînçikdar/: ئاوەڵناو. سووچدار؛ بەگۆشە 🇮🇷 گوشەدار

**قولینگ** / qulîng/: ☜ **قازیقوڵنگ**

**قولێر** / qulêr/: ناو. دەربیجە؛ کون دە ژووردا بۆ رووناکایی 🇮🇷 دریچه

**قوڵ**[١] / quɫ/: ناو. بنی هێلکە 🇮🇷 ته تخم پرنده

**قوڵ**[٢]: ئاوەڵناو. ١. کورت؛ کۆتا ٢. کلک‌پەڕیو؛ جووچکە قرتیاگ 🇮🇷 ١. کوتاه ٢. دُم‌بُریده

⊡ **قوڵ بوون:** دوو نەمان؛ بێ‌کلک بوون؛ قۆڵە بوون 🇮🇷 دُم‌بریده بودن

**قوڵ**[٣]: دەنگەناو. قولت؛ قولتە؛ قلپە؛ دەنگی ئاوی بەکوڵ 🇮🇷 قُل

**قوڵاخ**[١] / quɫax/: ناو. قولاغ: ١. قۆزاخە پەمۆ ٢. جێگەی ئاو دابەش کردن لە مەرەزە ٣. بەڵگە و نیشانەی حەیوانی گومبوو کە دەبێ شوان نیشانی بدا 🇮🇷 ١. غوزه ٢. جای تقسیم آب شالیزار ٣. نشان دام گمشده که از چوپان می‌خواهند

• **قوڵاخ**[٢]: پاشەوشە. ـــ قولاغ؛ قنج؛ قیت؛ قوت؛ ڕەپ‌وڕاست ‹گوێ‌قوڵاخ ڕاوەستاوە› 🇮🇷 شَق

**قوڵاخە** / quɫaxe/: ناو. قولاغە؛ قۆڵخ: ١. چۆنیەتی کۆ بوونەوەی ماسی بە دەوری یەکەوە لە زستاندا ٢. کون و چالاوی نێو زەا و قامیشەڵان کە زستانان دەبێتە خزگەی ماسی لە ٣. پینەی لێواری پێڵاو 🇮🇷 ١. اجتماع ماهی‌ها در زمستان ٢. پناهگاه ماهی‌ها در زمستان ٣. پینەی کنارەی کفش

⊡ **قوڵاخە دان:** قولاغە دان: ١. پەنا گرتنی ماسیان لە خزگەدا ٢. سەر دەرکەوتنی ڕێبوار لە ئاسۆوە 🇮🇷 ١. پناه گرفتن ماهیان در زمستان ٢. نمایان شدن سر رهرو از افق

**قوڵاغ** / quɫağ/: ☜ **قوڵاخ**

**قوڵاغە** / quɫağe/: ☜ **قوڵاخە**

⊡ **قوڵاغە دان:** ☜ **قوڵاخە دان**

**قوڵان** / quɫan/: چاوگ. کولیان؛ کەلین؛ کوڵان؛ هاتنە کوڵ 🇮🇷 جوشیدن

**قوڵانن** / quɫanin/: چاوگ. کوڵانن؛ کەلاندن؛ کولاندن 🇮🇷 جوشاندن

**قوڵانیسک** / quɫanîsk/: ناو. کونارشک؛ ئانیشک 🇮🇷 آرنج

**قوڵب**[١] / quɫb/: ناو. قولپ: ١. دەسک و هەنگڵی دەفر؛ دەسکە گۆزە و شتی‌تر ٢. ئالقە؛ قلف 🇮🇷 ١. دستگیره؛ دسته ٢. حلقه

**قوڵب**²: ئاوەڵناو. قولپ؛ وەرگەڕاو ■ زیرورو

**قوڵباندن** / qułbandin/: چاوگ. شاردنەوە؛ داشاردن ■ پنهان کردن

**قوڵپ**¹ / qułp/: ☜ **قوڵب**

⊡ **قوڵپ بوون:** سەرنخوون بوون ■ زیرورو شدن

**قوڵپ**²: دەنگ. ١. دەنگی هەڵقوڵینی ئاو لە سەرچاوەوە ٢. دەنگی کەوتنە نێو ئاوەوە ٣. دەنگی ئاوی لە سەر ئاگر کوڵ هاتوو ٤. دەنگی کوڵی گریان ‹جوابی دامەوە بە قوڵپی گریان/ منیش وا جەرگم بووە بە بریان «پیرەمێرد»› ■ ١. صدای جوشیدن آب از سرچشمە ٢. صدای افتادن در آب ٣. قُل؛ صدای جوشیدن آب ۴. صدای گریەی ناگهانی

⊡ **قوڵپ دان:** هەڵقوڵان ‹بەڵێ کاتێ کە ئەو دەرکەوت، ئیتر من بێسەر و شوێنم/ بە تیشکی خۆری جوانی ئەو بەجارێ قوڵپ ئەدا خوێنم «هەردی»› ■ فوران کردن

**قوڵپاندن** / qułpandin/: ☜ **قولپاندن**

**قوڵپن** / qułpin/: ☜ **قوڵپنە**

**قوڵپنە** / qułp(i)ne/: ئاوەڵناو. قولپن؛ داکوتیاگ؛ کورتەبالای قەڵەو ■ کوتاەقد چاق

**قوڵپەژێر** / qułpejêr/: ناو. تۆمی گوڵی هێرۆ ■ دانەی گُل ختمی

**قوڵپەقوڵپ** / qułpequłp/: دەنگەناو. قوڵەقوڵ؛ دەنگی لە شوێن یەکی جۆشینی ئاو ■ غُلغل

**قوڵپین** / qułpîn/: ☜ **قوڵپبوونەوە**

**قوڵت**¹ / qułt/: ناو. قورسە؛ شمش ■ شمش

**قوڵت**²: دەنگ. ١. دەنگی کولانی ئاو ٢. دەنگ و بلقی کەوتنە نێو ئاو ■ ١. قُل؛ صدای جوشیدن آب ٢. صدا و حُباب افتادن در آب

⊡ **قوڵت دان:** قوڵتان؛ کوڵین ‹لە سەر چڵی دار هەزاران بولبول/ وەک مەنجەڵ دەکوڵن، دەدەن قوڵت و کوڵ «ئاوات»› ■ قُل زدن

**قوڵتان** / qułtan/: چاوگ. قوڵتیان: ١. چوونە ژێر ئاو ٢. کوڵانی ئاو ■ ١. غوطه خوردن ٢. جوشیدن

**قوڵتاندن** / qułtandin/: چاوگ. قوڵتانن؛ قوڵتنای: ١. دە ژێر ئاو ڕاکردن ٢. کوڵاندن (ئاو و تراوی تر) ■ ١. زیر آب فروکردن ٢. جوشاندن

**قوڵتانن** / qułtanin/: ☜ **قوڵتاندن**

**قوڵتخ** / qułtix/: ناو. قۆڵتخ: ١. بن‌هەنگڵ ٢. بن‌کەوش ■ ١. زیر بغل ٢. زیر کفش

**قوڵتر** / qułtir/: ئاوەڵناو. *[پلار]* سووک و چرووک (پیرەژن) ■ بی‌مقدار (پیرزن)

**قوڵتنای** / qułtnay/: ☜ **قوڵتاندن**

**قوڵتە**¹ / qułte/: ناو. ١. خێزانە باڵندەیەکە لە دارەسمەی بچووک دەچن، لە کوناندا هێلانە دەکەن، چەن جۆریان هەیە: بەردەوان؛ قوڵتەی بچووک؛ قوڵتەی دارستان؛ قوڵتەی گەورە ٢. بلقی چوونە ژێر ئاو ■ ١. کمرکلی ٢. غوطه

**قوڵتە**²: دەنگەناو. ١. دەنگی کوڵانی ئاو ٢. دەنگی کەوتنە نێو تراوێکەوە ■ ١. صدای جوشیدن آب ٢. صدای در مایعی افتادن

**قوڵتەخۆرە** / qułtexore/: ناو. بینەکێش؛ جانەوەرێ کە بە بن ئاودا بڕوا ■ جانور هوازی کە زیر آب راه برود

**قوڵتەش** / qułteş/: ☜ **قوڵتەشە**

**قوڵتەشە** / qułteşe/: ئاوەڵناو. قولتەشە؛ قوڵتەش؛ بێشەرم؛ ڕووقایم ■ بی‌شرم؛ پررو

**قوڵتەفسە** / qułtef(i)se/: ناو. *[شووروەیی]* کونی قنگ ■ مقعد؛ پیزی

**قوڵتەقوڵت** / qułtequłt/: دەنگەناو. دەنگی قوڵتەی لە پەستا ■ قُل ـ قُل

**قوڵتیان** / qułt(i)yan/: ☜ **قوڵتان**

**قوڵتیای** / qułt(i)yay/: چاوگ. قولان؛ کوڵان ■ جوشیدن

**قوڵچخ** / qułçix/: ☜ **قالچغ**

**قوڵخ / quḷx/**: ناو. ١. کاڵەدڕانەی پیاوی دەوڵەت ٢. باجگە؛ باجگرخانە ٣. کۆختە؛ کۆخ؛ خانووی زۆر چکۆلە ≡ ١. پایمزد مأمور دولت ٢. باجگیرخانە ٣. کوخ

**قوڵدر / quḷdir/**: ئاوەڵناو. ملهوڕ؛ شەلاتی ≡ قُلدر

**قوڵف / quḷf/**: ناو. قلف؛ قولف: ١. ئاڵقە؛ قەف ٢. دەسکی دەفر ٣. قفڵ؛ گۆڵە ≡ ١. حلقە ٢. دستگیرەی ظرف ٣. قُفل

⊡ **قوڵف دان**: قفڵ دان؛ داخستن بە قفڵ ≡ قُفل کردن

**قوڵف کردن**: ١. داخستن بە قوڵف ٢. توند هەڵپێکان و پێکەوە لکاندن ≡ ١و٢. قفل کردن

**قوڵف لێدان**: ١. قولف دان ٢. ئاڵقە کردنی بەن و پەت ≡ ١. قفل زدن ٢. حلقە کردن نخ و ریسمان

**قوڵف لێنان**: ١. دەسک لە دەفری گڵین قایم کردن ٢. *[کینایە]* تاریف کردنی زیاد لە پێویست ≡ ١. دستە بر ظرف سُفالین نهادن ٢. هندوانە زیر بغل زدن

**قوڵفاوقون / quḷfawqûn/**: ئاوەڵناو. پێچەوانە؛ چەپەوانە ‹قسەی قولفاوقوون› ≡ وارونە

**قوڵفساز / quḷ(i)fsaz/**: ناو. قفڵساز؛ کلیلساز ≡ قُفلساز

**قوڵفە / quḷfe/**: ناو. ١. ئاڵقە؛ حەڵقە ٢. جۆرێ گرێی بەئاڵقە کە سەری داوەکە بکێشی دەکرێتەوە ≡ ١. حلقە ٢. گرە پاپیونی

**قوڵفی / quḷfî/**: ئاوەڵناو. قوفڵی؛ قوفڵ کردنی ≡ قُفلی

**قوڵقوڵانباز / quḷquḷanbaz/**: ئاوەڵناو. فێڵەباز؛ ساختەچی ≡ مُتقلب

**قوڵقوڵ / quḷquḷ/**: دەنگ. قوڵتەقوڵت؛ دەنگی کولانی ئاو ‹گەر نییە ئاور لە سینەمدا بە تاو/ بۆچ لەبەر قوڵقوڵ غەریقی ئاوم ئەز؟ «نالی»› ≡ غُلغُل

**قوڵقوڵە¹ / quḷquḷe/**: ناو. ١. سەرچاوە ئاوێ کە لە چەند جێوە جۆش ئەدا ٢. فیچقە؛ کوفارە ≡ ١. آبی کە از چند جا می‌جوشد ٢. فوّارە

**قوڵقوڵە²**: دەنگ‌ناو. دەنگی قوڵتەقوڵتی لەکوڵ ≡ غُلغُل آب جوشان

**قوڵقێنە / quḷqêne/**: ☜ قرقێنە

**قوڵکە / quḷke/**: ناو. قووتە؛ گۆنجاڵ؛ چاوانە؛ چاڵ ≡ گودال

**قوڵم / quḷm/**: ئاوەڵناو. خۆبەزلزان؛ خۆبایی ≡ مغرور

**قوڵمی / quḷmî/**: ناو. خۆبەزلزانی ≡ غرور

**قوڵنگ / quḷing/**: ناو. ١. ☜ قوڵنگە ٢. ☜ قازیقوڵنگ

**قوڵنگە / quḷinge/**: ناو. قولنگ؛ قولەنگ؛ قولەنگە؛ قازمە؛ قەزمە؛ قولنگە؛ قۆڵنگە؛ قولینگ؛ کولینگ؛ کۆلەک؛ زەنگن؛ زەنگەن؛ سنکۆڵک؛ پاچی دووسەر؛ ئامێرێکی کانزایی بە دەمێکی تیژ و دەمێکی پان و دەستەیەکی ئەستووری دارینەوە، بۆ زەوی کەندن و بەرد شکاندن و... ≡ کلنگ

**قوڵۆبچە / quḷobçe/**: ناو. دوگمە؛ دگمە؛ کلانە؛ پشکوژ ≡ دُکمە؛ تُکمە

**قوڵە¹ / quḷe/**: ناو. ١. قوڵ؛ بنی هێلکە ٢. کلۆ؛ کوللە ≡ ١. تە تخم‌مرغ ٢. ملخ

**قوڵە²**: ئاوەڵناو. قوڵ: ١. کورت؛ کوڵ ٢. بێکلک ≡ ١. کوتاە ٢. بی‌دُم

**قوڵە ـ³**: پێشوشە. ١. کورتە ـ ‹قولەباڵ؛ قولەدار› ٢. زڕ ـ ‹قولەبەگ› ≡ ١. کوتاە ـ ٢. ناسَرە

**قوڵەباڵ / quḷebaḷ/**: ناو. فەرەنجی؛ پەستەک ≡ جلیقەی نمدی

**قوڵەبنە / quḷeb(i)ne/**: ئاوەڵناو. کورتەباڵای ئەستوور ≡ کوتاەقد کلفت

**قوڵەبەگ / quḷebeg/**: ناو. بەگی لەقەستینە کە بۆ

فیز و پۆز ئەتواری بەگ دەردێنێ ☰ خان دروغین

**قوڵەپێچ** / quɫepêç/: ناو. ١. کاری دەست بەستنی توند لەپشتەوە ٢. کوڵەپێچ؛ کاری بردنی کەسێ یا حەیوانێ بە پەلە ☰ ١. عمل مُحکم بستن دست از پشت ٢. عمل بردن کسی یا حیوانی با عجله

**قوڵەجوقە** / quɫecûqe/: ناو. قولەچەقە؛ تۆرەمە باڵندەیەکن، زۆرتر لە سەر دار دەژین، لە شوێنی بەرز و قیت هەڵدەنیشن و بۆ گرتنی نێچیر دێنە فرین و پاش ڕاو دەگەڕێنەوە شوێنی خۆیان، مێش و جاڵجاڵووکە ڕاو دەکەن، چەن جۆریان هەیە: خاڵخاڵ، سینگ‌سوور، نێوچاوان سپی ☰ مگس‌گیر

**قوڵەچوارشەممە** / quɫeç(i)warşemme/: ناو. قولەچوارشەمۆ؛ چوارشەمەسووری؛ ئاخر چوارشەمەی ساڵ ☰ چهارشنبه‌سوری

**قوڵەچوارشەمۆ** / quɫeç(i)warşemo/: ☜ قوڵەچوارشەممە

**قوڵەچۆماغ** / quɫeçomağ/: ناو. داری سەرئەستوری قولە و لە دەستان خۆش ☰ چُماق کوتاه

**قوڵەچەقە** / quɫeçeqe/: ☜ قوڵەجوقە

**قوڵەدار** / quɫedar/: ناو. داری کۆتا؛ داردەستی قولە ☰ چوبدستی کوتاه

**قوڵەشین** / quɫeşîn/: ناو. کەروێشک؛ کەورێشک ☰ خرگوش

**قوڵەشینە** / quɫeşîne/: ناو. ماسی‌چنە؛ تۆرەمەباڵندەیەکی قەراخی ئاون، لە ئەندازەی کاسەلەشینکە، سەریان گەورە و کلکیان کورتە، بۆ ڕاو کردنی ماسی خۆ دەخەنە ناو ئاو و لە ژێرەوە بینە دەکێشن، بە تەنیا دەژین، چەن جۆریان هەیە: قولەشینەی بەلەک، سینگ سپی و ... ☰ ماهی‌خورک

**قوڵەغە** / quɫeğe/: ☜ قوڵۆخە

**قوڵەفیتنە** / quɫefîtne/: ناوەڵناو. [کینایە] ١. کورتەباڵای ئاژاوەچی ٢. زیرەک؛ زرنگ ☰ ١. کوتاەقد فتنەانگیز ٢. زرنگ

**قوڵەقوڵ** / quɫequɫ/: ☜ قوڵپەقوڵپ

**قوڵەکەیخودا** / quɫekeyxuda/: ناو. کەیخودای لەقەستینە ☰ کدخُدای دروغین

**قوڵەنگ** / quɫeng/: ناو. ١. ☜ قوڵنگە ٢. ☜ قازیقوڵنگ

**قوڵەنگە** / quɫenge/: ☜ قوڵنگە

**قوڵەنەخشینە** / quɫenexşîne/: ☜ قۆلانچەژارە

**قوڵیان** / quɫyan/: چاوگ. کولیان؛ هاتنە کوڵ ☰ جوشیدن

**قوڵیای** / quɫyay/: چاوگ. قولان؛ کولان ☰ جوشیدن

**قوڵیت** / quɫît/: ناو. ١. خانووی چکۆلە بۆ ڕاوکەر ٢. کۆڵیت؛ خانووی بچکۆلانەی خراب ☰ ١. کمینگاه شکارچی ٢. کوخ مُحقر

**قوڵیجان** / quɫîcan/: ناو. گیایەکە وەک ماڵۆنجە، بە زەویندا پان دەبێتەوە، بەرێکی ورد دەگرێ وشکی دەکەن و لەگەڵ چای دەمی دەکەن بۆ هەلامەت و سەرما بوون ☰ گیاهی دارویی

**قوڵیقوڵی** / quɫîquɫî/: ☜ قولقولان

**قوڵین** / quɫîn/: چاوگ. ١. هاتنە کوڵ ٢. هەڵقولین ☰ ١. جوش آمدن ٢. فوران کردن

**قوڵینگ** / quɫîng/: ☜ قوڵنگە

**قوڵینگە** / quɫînge/: ☜ قازیقوڵنگ

**قوڵینە** / quɫîne/: ☜ قرتاڵ

**قوڵێنک** / quɫênik/: ☜ قرقێتە

**قوم**[1] / qum/: ناو. ١. قۆپ؛ گوڵپ؛ فرێ لە ئاو (قومێ ئاو بۆ مێرووله لافاوە «مەسەل») ٢. کووپەڵە؛ گۆزەی پچووک ٣. کووپەی ئاو ٤. سوێنەی زل ٥. کۆل؛ جێگەی ئاودانی ماڵات لە حەڵەبی، دار یان لە قوڕ ☰ ١. جُرعه ٢. خُمچه ٣. کوزەی آب ۴. تشت سُفالین بزرگ ۵. ناو آبشخور دام‌ها

⊡ **قوم لێ دان**: فڕ کردنی کەم ـ کـەم ☰ جُرعـە ـ جُرعە نوشیدن

**قوم**[٢]: ئاوەڵناو. ١. داخ؛ گەرم ٢. نوقم؛ نقووم؛ نخرۆ؛ بناو ☰ ١. داغ ٢. غرق

⊡ **قوم بوون**: وە ژێر ئاو کەوتن؛ نوقمەسار بوون ☰ غوطەور شدن

**قوم کردن**: نخرۆ کردن؛ وە ژێـر ئـاو خسـتن ☰ غوطەور کردن

**قومات** / qumat/: ☜ **قۆنداخە ـ٢**

**قوماتە** / qumate/: ☜ **قۆنداخە ـ٢**

**قوماچ** / qumaç/: نـاو. ١. سیلەی دیوار ٢. پێچـی ڕێگە ٣. ئامانج؛ نیشانە ☰ ١. نبش دیوار ٢. پـیچ راه ٣. هدف

**قومار** / qumar/: ناو. ١. قومـاران؛ کایـە لـە سـەر پووڵ ٢. قوماران؛ یـاری بـۆ ڕابـواردن ٣. گاڵـتە؛ قسەی بەگەمە ☰ ١. قُمار ٢. بازی ٣. شوخی

⊡ **قومار کردن**: ١. کایە کردن لـە سـەر پـووڵ ٢. یاری کردنی زارۆکان ٣. شۆخی و گاڵتە کردن ٤. کڵاو سەر نان بۆ گاڵتە ☰ ١. قُمـار کـردن ٢. بازی کردن بچەها ٣. شوخی کردن ۴. فریب دادن به شوخی

**قوماران** / qumaran/: ☜ **قومار ـ١و٢**

**قوماربا**ز[١] / qumarbaz/: ناو. قومارچی؛ قومارکـەر؛ کەسێ کە لە سەر پارە بازی دەکا ☰ قُمارباز

**قومارباز**[٢]: ئاوەڵناو. *[کینایە]* ١. فێڵـباز؛ گزیکـار ٢. گاڵتەچی؛ جەفەنگباز ☰ ١. حیلەگر ٢. شوخطبع

**قوماربازی** / qumarbazî/: ناو. ١. کایەی دۆڕانـدن و بردنەوەی پارە ٢. *[کینایە]* فێڵبازی؛ گزیکاری ٣. کاری گەمە و گاڵـتە کـردن ☰ ١. کـار قُماربـاز ٢. نیرنگبازی ٣. شوخطبعی

**قومارچی** / qumarçî/: ☜ **قومارباز**[١]

**قومارخانە** / qumarxane/: ناو. جێگەی قوماری لە سەر پارە کردن ☰ قُمارخانە

**قومارکەر** / qumarker/: ☜ **قومارباز**[١]

**قوماش** / qumaş/: نـاو. کووتاڵ؛ پارچەی گەزی ☰ پارچە

**قومام** / qumam/: نـاو. گیایەکی ئالیکییە، لە گەنم دەکا ☰ گیاهی است

**قومامە** / qumame/: ناو. قەمامە: ١. تەقەڵدرووی لای سەرووی دوو تا جەواڵ پێکـەوە ٢. تەقەڵـی درشت و قـایم ☰ ١. بـە هـم دوزی طـرف بـالای دولنگە بار ٢. کوک درشت

**قوماندار** / qumandar/: نـاو. قومانـدان؛ زابـت؛ سەرکردەی لەشکر ☰ فرماندەی لشکر

**قوماندان** / qumandan/: ☜ **قوماندار**

**قوماندن** / qumandin/: چاوگ. داخ کـردن ☰ داغ کردن

**قوماهەنگ** / qumaheng/: ناو. قسڵ و خۆڵـەمێش بۆ سواخ دانی حەوز و دیواری بەردین ☰ ساروج

**قومبولە** / qumbule/: ☜ **قومبەرە**

**قومبوو** / qumbû/: ئاوەڵناو. سەرنقۆت؛ نخرۆ؛ نغـرۆ ☰ غرق‌شدە

**قومبـەرە** / qumbere/: نـاو. قومبولـــە؛ قونبولـــە؛ قونبەڵە؛ قۆمبەڵـە؛ قەمبـەرە: ١. بـووم؛ بۆمبـا ٢. بەرکەتۆپ؛ گوللەی تۆپ ٣. نارنجۆک ☰ ١. بُمـب ٢. گلولەی توپ ٣. نارنجک

**قومپـارە** / qumpare/: نـاو. خومپـــارە؛ جۆرێـــک گوللەی تۆپ ئاسا کـە بـەر لـەوەی بگاتـە زەوی دەتەقێتـەوە و پلاشـەی زۆری لـێ دەبێتـەوە ☰ خُمپارە

**قومپاژنە** / qumpajne/: ناو. قومپانی؛ پاژنەی پا ☰ پاشنەی پا

**قومپـانی** / qumpanî/: نـاو. ١. ☜ **قومپاژنـە** ٢. دەزگای بازرگانی فرەبەش ☰ ١. ☜ **قومپاژنە** ٢. کُمپانی

**قومپۆز** / qumpoz/: نـاو. بافیش؛ قۆپز؛ قوپژ؛ خۆ بە

زل زانی بە هۆی قەوم و خزمانەوە ☰ قُمپز

**قومچ** / qumç/: ناو. باز؛ بازباز؛ بازبازێن ☰ پرش

**قومچە** / qumçe/: ناو. دوگمـە؛ کلانـە؛ پشـکوژ ☰ دگمە

**قومری** / qumrî/: نـاو. ١. باڵندەیەکە لە تۆرەمـەی کۆتر، بە سەر و ملی شەڕابی کاڵ، سەرملی پنۆک ـ پنۆک، پشتی خورمایی، بـەرزگی ئامـاڵ‌سـپی، شاباڵی شینی کاڵ، ئالقەی دەوری چـاو و لاقـی سوور کە لە سەر دار و خـانوان هێلانـە دەکـا ٢. داشکەلەم؛ جۆرێ کەلەمی بـێ‌گـەلا ☰ ١. قُمـری خانگی ٢. کلم قُمری

**قـومش**[١] / qumiş/: نـاو. بـیر؛ چـاڵ؛ چاڵـی؛ چـە؛ کەندێکی گرۆڤەری قووڵ لە زەویدا ☰ چاه

**قـومش**[٢]: ئاوەڵـناو. ١. چکـووس؛ ڕژد ٢. کەنکەنـە؛ زۆر زەلام ☰ ١. خسیس ٢. بسیار درشت

**قومشـەڵ** / qumşeł/: نـاو. بێشـە و قامیشەڵـێنی چغور ☰ بیشە و نیزار انبوە

**قومقۆر** / qumqor/: ☜ **قومقمۆك**

**قومقمۆک** / qumq(i)mok/: ناو. قمقمۆر؛ قمقمۆکە؛ قمقمـە؛ قمقمـۆک؛ قومقمۆکـە؛ قومقومـە: ١. سەرمازەڵە ٢. مەتارە؛ دەفـری ئـاوی سـەفەر ٣. تۆنگەی مل‌باریک ☰ ١. بُزمجـە؛ نـوعی چلپاسـە ٢. قُمقمە ٣. تُنگ گردن باریک

**قومقمۆکە** / qumq(i)moke/: ☜ **قومقمۆك**

**قومقومۆک** / qumqumok/: ئـاوخۆرە؛ ئـاوخۆری؛ کومکومۆک

**قومقومە** / qumqume/: ناو. ١. تونگـەی جێگـەی تراو ٢. مەتارەی سەفەر ٣. سەرمازەڵە ☰ ١. تُنگ آب ٢. قُمقمە ٣. بُزمجە

**قومل** / quml/: ناو. باز؛ بازباز؛ بازبازێن ☰ پرش

**قوملاخ** / qumłax/: ناو. قملاخ: ١. زەمینی ڕۆچوو ٢. جلیتاو؛ قوڕی شل ☰ ١. زمین فرورفتە ٢. گل و لای

**قوموش** / qumuş/: ناو. قمووش؛ قمیش؛ قومـەش؛ تونێل؛ دالانەڕێ ☰ راه زیرزمینی

⊡ **قوموش لێ دان**: تونێـل لـێ دان؛ ڕێگـە بـە بـن زەویدا کۆڵین ☰ تونل زدن

**قوموشکەن** / qumuşken/: ☜ **قومەشکەن**

**قومەزە** / qumeze/: ئاوەڵـناو. زۆڵ؛ بیـژوو؛ بـیچ ☰ حرامزادە

**قومەش** / qumeş/: ☜ **قوموش**

**قومەشـکەن** / qumeşken/: نـاو. قوموشـکەن؛ کەنکەنەچی؛ ڕەهەندلێدەر ☰ مُقنی

**قومیای** / qumyay/: ناو. ئامێری داغ کردن ☰ ابزار داغ‌گذاری

**قون** / qun/: ☜ **قونە**

**قوناخە** / qunaxe/: ☜ **قۆنداخە**

**قونان** / qunan/: ☜ **قونە کردن**

**قونبولە** / qunbule/: ☜ **قومبەرە**

**قونبەڵە** / qunbełe/: ☜ **قومبەرە**

**قونتار** / quntar/: نـاو. بنار؛ پێدەشت؛ دامێنی چیا ☰ دامنەی کوە

**قـونتس** / quntis/: نـاو. تووتـەک؛ تـوولنج؛ گەماڵ‌فس؛ حاڵەتی هەڵتووتەکانی سەگ و ڕێوی و ... ☰ چُمباتمە

⊡ **قـونتس دانـەوە**: تڕووشـکان؛ هەڵـتووتەکان؛ جنینچکە دان ☰ چُمباتمە زدن

**قونتک** / quntik/: ناو. یاپراخ؛ دۆڵـمەی پەلکـەمێو ☰ دُلمەی برگ مو

**قونتەرات** / qunterat/: ناو. کونتـەرات؛ قۆنتـەرات؛ مەختە؛ قەبەڵ؛ کاری لەبڕ ☰ کُنترات

**قونج** / qunc/: نـاو. کونج؛ قوژبن؛ سیلە؛ سـووچ ☰ گوشە

**قونجاندن** / quncandin/: ☜ **قوجاندن**

**قونجریک** / qunc(i)rîk/: ناو. ١. ڕەوتی ڕووشان بە چنجڕووک ٢. ☜ **قورنج** ☰ ١. خراش با نـاخن ٢.

☜ **قورنج**

**قونجڕ** / quncir̄/: ناو. ١. قونجـڕک؛ چنجـڕووک؛ قونجلیسک؛ پەنجەی دڕنـدە ٢. ڕەوتی ڕووشـان ٣. قونجڕکە؛ پەیکوڵ؛ دڕکێکە ٤. ☜ **قـورنج** ⊏ ١. پنجەی جانور شکاری ٢. خراش ٣. خار سـەکوهـە ٤. ☜ **قورنج**

**قونجڕک** / qunc(i)r̄k/: ☜ **قونجڕ ـ١**

**قونجڕکە** / quncir̄ke/: ☜ **قونجڕ ـ٣**

**قونجک** / quncik/: ☜ **قنچك**

**قونجلیسک** / qunc(i)lîsk/: ☜ **قونجڕ ـ١**

**قونچک** / qunçik/: ناو. ١. کلکەی مێوژ و ترێ ٢. باریکەی کلکی توور و گێزەر و... ٣. ئاغزەجگەرە ⊏ ١. دُمچەی مویز و انگور ٢. انتهای ریشەی هـویج و تُربچە و... ٣. فیلتر سیگار

**قونچکە** / qunçke/: ناو. زڕرک؛ زیپکـە؛ چینچکـە ⊏ جوش پوست

**قونچکەزێڕ**[1] / qunçkezêr̄/: ناو. جگەرەی ئاغزەدار ⊏ سیگار فیلتردار

**قونچکەزێڕ**[2]: ئاوەڵناو. *[کینایە]* کورتەبالای جـوان ⊏ ریزنقش زیبا

**قوند** / qund/: ئاوەڵناو. *[بەلار]* قـوڵ؛ کلـکبـڕاو ⊏ دُمبریدە

**قونـدک** / qundik/: نـاو. کـەدوو؛ کونـدر؛ کـدو؛ کوولەکە؛ کۆلەکە ⊏ کدو

**قوندە** / qunde/: ناو. ١. باڵداری کلـککـورت ٢. باڵدارێکە ⊏ ١. پرندەی دُمکوتاە ٢. پرندەای است

**قوندیلانـە** / qundîlane/: ئاوەڵنـاو. قوندیلـە؛ خونچیلانە ⊏ کوچولوی دلنشین

**قوندیلە** / qundîle/: ☜ **قوندیلانە**

**قونسور** / qunsûr/: ناو. ١. گیایەکە لە دۆخـەوای دەکەن ٢. عەنتەر؛ جـۆرێ مـەیموونی لـۆتی ٣. شابەندەر؛ کونسوول ⊏ ١. گیـاهی آشـی ٢. انتـر ٣. کنسول

**قونـوت** / qunût/: نـاو. *[ئیسلام]* دۆعایـەکی نـوێژە بەتایبەت دوای ڕکاتی دووەم: ئەلف) سوننی دوای ڕکووع ب) شێعە پێش ڕکووع دەیخوێنن ⊏ قنوت

**قونە** / qune/: ناو. قنە؛ قـون؛ شـێوازە ڕۆیشـتنی کۆتر و کەو ⊏ خرام؛ شیوەی راە رفتن کبک و کبوتر

⊡ **قونە کردن**: قونان؛ قونین؛ قنە کردن؛ بە هەڵبەز ـ دابەزەوە ڕۆیشتن ⊏ خرامیدن

**قونەقون**[1] / qunequn/: ناو. کـاری ڕۆیشـتن بـە هەڵبەز ـ دابەز ⊏ ورجە؛ نوعی راە رفـتن پرنـدە بـا جست و خیز

**قونەقون**[2]: ئاوەڵکار. بەقونـە؛ بەهەڵبەزـ دابـەزەوە ‹کەوباریش قونەقون لە شوێن دایکیان ڕۆیشـتن› ⊏ با جست و خیز

**قونەک** / qunek/: ☜ **قنگدەر**

**قونیچ** / qunîç/: ☜ **قولنچك**

**قونیک** / qunîk/: ناو. قول؛ قاپ؛ قولەقاپە؛ قولاپەی پێ ⊏ قوزک پا

**قونین** / qunîn/: ☜ **قونە کردن**

**قونێر** / qunêr/: ناو. ئاشین؛ دمەڵ؛ گۆنر ⊏ دُمل

**قوە** / q(i)we/: ناو. قەوە؛ هێز ⊏ قدرت

**قوێل** / q(i)wîl/: ☜ **قوڵ**

**قوێخا** / q(i)wêxa/: ☜ **کەیخودا**

**قوێخایـەتـی** / q(i)wêxayetî/: نـاو. کخـیتی؛ کەیخودایی ⊏ کدخُدایی

**قوێرە**[1] / q(i)wêre/: ناو. چک؛ چکە؛ دیوی قووڵی میچ ⊏ طرف گود شتالنگ

**قـوێرە**[2]: ئاوەڵـناو. پووچـەڵ؛ بـێکاکڵـە (گـوێز) ⊏ توخالی (گردو)

**قـۆپ** / qop/: ئاوەڵـناو. ١. کـۆم؛ پشـتچـەماو ٢. گۆچ؛ ئیفلیج ⊏ ١. کوژپُشت ٢. فلج

⊡ **قۆپ بون**: ١. خوار و گێڕ بوون ٢. داهاتنەوە ⊏ ١. کج و کولە بودن ٢. خمیدن

**قـۆپـان**[1] / qopan/: چـاوگ. ١. لار بوونـەوە؛

داهاتنەوە ٢. ☜ **قوپان** ◼ ١. کج شدن ٢. ☜ **قوپان**

**قۆپان**[٢]: ناو. گیاجاڕی تایبەتی بۆ لەوەڕی ئاژەڵ ◼ چراگاه اختصاصی

**قۆپاندن / qopandin/**: چاوگ. ١. لار کردنەوە؛ داهێنانەوە ٢. ☜ **قوپاندن** ◼ ١. کج کردن ٢. ☜ **قوپاندن**

**قۆپچە / qopçe/**: ناو. ١. دوگمە؛ بشکۆژ ٢. جۆرێ بەری دار مازوو ◼ ١. دُگمە ٢. نوعی ثمر مازوج

**قۆپز / qopiz/**: ☜ **قومپۆز**

**قۆپکە / qopke/**: ناو. ١. سەری خڕی شتی باریک ٢. ترۆپکی چیا ◼ ١. سر گرد جسم باریک ٢. قُلەی کوه

**قۆپۆز / qopoz/**: ناو. ١. بێڤلی بەران ٢. جێگەی قایش لە نیری جووتدا ◼ ١. پوزەی قوچ ٢. وسط یوغ کە خیش را در آن می‌بندند

**قۆپەن / qopen/**: ناو. ١. پەڵەگیای بلند لە ناو مێرگ و گیاجاڕدا ٢. پەڵە؛ لەکەی ڕەنگ، هەور و ... لە نێو هەور و ڕەنگی‌تردا کە زەقتر دیارە ‹مێرگی ئاسمان بە سووتمانی هەوری لۆکەیی نەزۆک/ پڕ لە خاڵ و قۆپەنە «سوارە»› ◼ ١. قطعە گیاه ساقە بلند در مرغزار ٢. لکە

**قۆپەنە / qopene/**: ناو. بنی شنگ کە ئەستوور و تۆپەڵەیە و دەخورێ ◼ ساقەی کلفت شنگ

**قۆپی / qopî/**: ناو. ١. زەلکاوی قامیشەلان ٢. کۆپی؛ ڕایش؛ ڕوونووس ◼ ١. مُرداب نیزاری ٢. رونوشت

**قۆپیە / qop(i)ye/**: ناو. ١. حیلە؛ فێڵ ٢. گزی لە ئەزموونداا ◼ ١. نیرنگ ٢. تقلب در امتحان

**قۆت / qot/**: ئاوەڵناو. ڕووت؛ پەتی؛ بێ بەرگ ◼ لُخت

**قۆتاسە / qotase/**: ناو. زەنبەری زێو ◼ زیور نقرە

**قۆتان / qotan/**: ناو. پێرک؛ عەرزێل؛ جێ کەلپەل لە ڕەشماڵدا ◼ جای اثاثیە در سیاەچادر

**قۆترمە / qotirme/**: ناو. بەلەک؛ پووز ◼ ساق

**قۆترە / qotre/**: ناو. ١. قۆتە؛ قۆرتە؛ گورگەلۆقە؛ نیوەغاری نارێک ٢. ئەسپ و ماینێ کە بە گورگەلۆقە دەڕوا ◼ ١. هرولە؛ یورغە ٢. اسب یورتمە

**قۆتڕ / qotiř/**: ناو. بارگینی پیری پەک‌کەوتە ◼ یابوی لکنتە

**قۆتک / qotik/**: ناو. ١. جاش باڵتە؛ باڵتۆی تا سەر زرانی ٢. مەرگی مفاجا ٣. نەخۆشییەکی ئاژەڵە ٤. کۆخەڕەشە ٥. گوڵنگ؛ گەڵەنگ ٦. تەپە؛ گرد ◼ ١. پالتو کوتاە ٢. مرگ ناگهانی ٣. نوعی بیماری دام ۴. سیاەسُرفە ۵. منگولە ۶. تپە

**قۆتل / qotil/**: ناو. هاوئاوایی؛ هاوماڵ لە دێدا ◼ همروستایی

**قۆتۆ / qoto/**: ئاوەڵناو. خەجاڵەت؛ تەرێقەوەبوو؛ فەدی کار ◼ شرمندە

**قۆتە / qote/**: ☜ **قۆتەرە**

**قۆتەرە / qotere/**: ناو. قوتوولە؛ قوتوومە؛ قۆتە؛ کۆتەرە: ١. بارستی ئەستوورایی دار ٢. کۆلکە بە ئەندازەی ئەستوورایی دار ٣. بارستایی دەوراندەوری دۆلاش ◼ ١. قطر تنەی درخت ٢. کُندەی تنەی کامل درخت ٣. سطح اطراف ناو آسیاب

**قۆتەی / qotey/**: چاوگ. قۆچ هاویشتن؛ شاخ وەشاندن ◼ شاخ زدن

**قۆتیک / qotîk/**: ☜ **قۆدی**

**قۆتین / qotîn/**: ئاوەڵناو. قوت؛ ڕووت (سەر) ‹زستانی وا سارد و سەری قۆتین؟!› ◼ برهنە (سر)

**قۆجک / qocik/**: ناو. پارچە ئێزنگی مەزن ‹باقێ من ل هەوشێ قۆجکان هوورد کە› ◼ قطعە هیزم بزرگ

**قۆجە**[١] **/ qoce/**: ☜ **قەوچە**[١]

**قۆجە**[٢]: ئاوەڵناو. کەونارا؛ زۆر لەمێژینە ◼ دیرینە؛

باستانی

**قـۆچ / qoç/**: نـاو. ١. بـەران؛ نێـری؛ سـابرین ٢. شاخی حەیوان ٣. گرێوە غاری سواران ٤. جۆرێ تەڵەی ڕاوی گورگ و ڕێوی ☰ ١. قوچ؛ گوسفند نر ٢. شاخ حیوان ٣. مسابقەی اسب‌دوانی ۴. نوعی تلەی شکار گرگ و روباه

▣ **قۆچی قوربـان**: ١. پەزێ کە لە جێژنی گەورەدا دەیکەنە خێـر ٢. *[کنایە]* فیـدایی؛ گیـان‌فیـدا ‹سەدشـوکور دووبـارە جەژنـە، وەختـی عـەیش و شادییە/ بـۆ بەلاگـەردانی بـالات قـۆچی قوربانـم وەرە! «تـاهیر بـەگ»› ☰ ١. گوسـفند قربـانی ٢. فدایی

▣ **قۆچ تێ‌هەڵدان**: ☜ **قۆچ وەشاندن**

**قۆچ لێدان**: ☜ **قۆچ وەشاندن**

**قـۆچ وەشاندن**: قۆچ تێ‌هەڵدان؛ قۆچ لێدان؛ قۆچ هاویشتن؛ شاخ وەشاندن ☰ شاخ زدن

**قۆچ هاویشتن**: ☜ **قۆچ وەشاندن**

**قۆچاخ / qoçax/**: ☜ **قۆچاغ**

**قۆچـاغ / qoçağ/**: ئاوەڵـناو. قۆچـاخ: ١. چـالاک؛ لەش‌سووک ٢. بەلەپا؛ بەپێ لە ڕێگەچوونـدا ‹لـە سایەی ڕاوی هەموو ڕۆژەوە دەگەڵ هـەمزە، ببووینـە پیادەیەکی وا قۆچاغ تاژیمان نەدەگەیشـتێ! «هـەژار، چێشتی مجێور»› ☰ ١. چُست و چالاک ٢. بادپا

**قۆچاغە / qoçağe/**: ناو. جۆرێ سەربەرەڵبێنە کـە لاقیش دادەپۆشێ ☰ نوعی پیشبند زنانە

**قۆچان / qoçan/**: ناو. ١. سەنەد؛ قەباڵەی ملک ٢. باجێکی سالانە، ئاغا لە ڕەعیـەتی دەسـەند ☰ ١. سند مالکیت ٢. بـاجی سـالانە کـە اربـاب از رعیـت می‌گرفت

**قۆچبەهدەر / qoçbehder/**: ناو. گیایەکە بۆ ڕەوانی دەبێ ☰ گیاهی مُسهل

**قۆچدار / qoçdar/**: ئاوەڵناو. شـاخدار؛ سـترۆدار ☰ شاخدار

**قۆچقۆچـانی / qoçqoçanî/**: نـاو. شەڕەشـاخ ☰ جنگ با شاخ

**قۆچک / qoçik/**: ناو. ١. قۆچکە؛ قۆرچک؛ کۆچکە؛ سەرپۆشێکە لە بەرچەنەوە دادەخرێ بـۆ زارۆک و هێنـدێک ژنی عێلاتییـە ٢. لەوەنـدی؛ ئەنگوچکەسۆرانی ☰ ١. کلوتەی زنانە و بچگانـە ٢. آستین بُلند

**قۆچکـە / qoçke/**: نـاو. ١. ☜ **قۆچـك ـ١** ٢. دەرپەڕیوەی سەری کلاو ☰ ١. ☜ **قۆچك ـ١** ٢. برجستگی روی کلاه

**قۆچکەتاش / qoçketaş/**: ناو. قۆچی‌تـاش؛ کـاری پێشەسەر تاشینی زارۆکـان بـۆ جـوانی ☰ نـوعی آرایش موی کودکان

**قۆچکەسۆرانی / qoçkesoranî/**: نـاو. ئەنگوچکـەی سۆارنی ☰ آستین بُلند

**قۆچوەشێن / qoçweşên/**: ئاوەڵـناو. تایبەتمەنـدی حەیوانێ کە بە شاخ لە خەڵک دەدا ☰ شاخزن

**قۆچـەقانی / qoçeqanî/**: نـاو. ١. قـایش‌کـێش؛ بـەرەقانی؛ بـەردەقانی؛ کەرسـتەیەکی بـەرد هاویشتنی بە چەڵەمەیەک و دوو قـایش و یـەک هەوانـەوە ٢. قەڵماسـک؛ قالماسـکە؛ کـەهنیک؛ کەرستەیەکی بەرد هاویشتنە لە یـەک هەوانـە و دوو پەتی درێژی ئەملا و ئەو لاوە ☰ ١و٢. فلاخن

**قۆچەمل / qoçemil/**: ☜ **ملەقۆچە**

**قۆچەملە / qoçem(i)le/**: ☜ **ملەقۆچە**

**قۆچی‌تاش / qoçîtaş/**: ☜ **قۆچکەتاش**

**قـۆخ[1] / qox/**: نـاو. ١. خـۆخ؛ قـۆخی؛ هەشتالـوو؛ هڵوو ٢. ☜ **قۆختە** ٣. چەو؛ زیخ؛ وردکەبەرد ٤. کۆمی؛ کـووری ٥. ترۆپـک؛ سـەرتۆپە؛ تۆپەسـەر ‹سینی ساوار و گۆشت لە سەر قۆخێ بوو› ☰ ١. هلو ٢. ☜ **قۆختە** ٣. شن ۴. خمیدگی ۵. بالاترین نقطه

▣ **قۆخ دان**: چەمانەوە؛ کۆمەوبوون ☰ خمیده شدن

**قـۆخ[2]**: ئاوەڵـناو. ١. قـۆپ؛ چـەماوە ٢. کـۆم؛

پشتچەماو ☰ ١. خمیده؛ کوژ ٢. کوژپشت

**قۆخا** / qoxa/: ☜ **کەیخودا**

**قۆختە** / qoxte/: ناو. قـۆخ؛ قـۆخڵ: ١. خـانووی چکۆلەی ڕاوچی لە دەشـت ٢. ماڵـی چکۆلـەی بێنرخ ☰ ١. کوخ شکارچی ٢. خانەی مُحقَّر

**قۆخڵ** / qoxił/: ☜ **قۆختە**

**قۆخە** / qoxe/: ناو. قفـە؛ قـۆزە؛ کۆخـە؛ کۆکـە ☰ سُرفه

**قۆخەڕەشە** / qoxeřeşe/: نـاو. سـیقوتە؛ قۆتـک؛ کوخکاڕەش ☰ سیاەسُرفه

**قۆخەقۆخ** / qoxeqox/: ناو. ١. دۆخی کۆخەی لـە سەر یەک ٢. کاری ڕۆیشتن بە پشتی چـەماو ☰ ١. سرفەی متوالی ٢. عمل خمیده راه رفتن

**قۆخی** / qoxî/: ☜ **قۆخ[١]ـ١**

**قـۆدک** / qodik/: نـاو. قـۆدی؛ قـوتیلخ؛ ئاوێنـەی گیرفان ☰ آینەی جیبی

**قۆدی** / qodî/: ناو. قۆتیک؛ قودیـک: ١. قوتـوو ٢. قۆدک ☰ ١. قوطی ٢. آینەی جیبی

**قـۆر[١]** / qor/: ناو. ١. کۆڕی هەڵـپەڕکێ ٢. پاشڵـی ئاژەڵ ٣. لوولاکی پێ ٤. نهۆم؛ تەبەقە ٥. قـۆرت؛ قۆپی ٦. کاری تـێڕوووکـان و بـە وردی تماشـا کـردن ☰ ١. حلقـەی رقـص ٢. دُم و دُنبـەی دام ٣. استخوان ساق پا ۴. اشکوبه ۵. برآمدگی ۶ عمـل بـه دور چیزی جمع شدن و نگریستن

⊡ **قۆر بوونەوە:** سەر دەرهێنان؛ قـوت بوونـەوە ☰ برآمدن

**قۆر[٢]:** ئاوەڵناو. داڵگۆشت؛ لاواز؛ لەجەر ☰ لاغر

**قـۆرت** / qort/: نـاو. ١. بـەرگر؛ لەمپـەر ‹قـۆرت و بەربەسـتی سیاسـی› ٢. بـەلا و چـۆرتم ‹هـەژاری خوەی بەتوون، قۆرتەکانی خراوە!› ٣. بەند و گـرێ (لـە چێـو و قـامیش و ...) ٤. چـالایی زەوی ‹پـڕ کردنەوەی قۆرت و چاڵەکانی ڕێگا› ٥. بەرزایی کەم لە ڕێگەی ڕاستدا ‹حولوولی مەزهەبێکە بـێ گـرێ و قۆرت/ تەناسوخ ڕێگەیێکـە ڕاسـت و هـەموار «شـێخ ڕەزا»› ٦. گۆترە؛ کـاری کـڕین و فرۆشـتنی بـێ پێوان و کێشان ٧. ملی باڵدار ٨. جۆرێک ڕەوتی یەکسم ☰ ١. مانع ٢. بلا؛ آسیب ٣. گـره (در چـوب و نی و... ) ۴. چالەچوله ۵. دستانداز ۶ رَمَکـی؛ خریـد و فروش بدون توزین و حساب ۷. گردن پرنده ۸. نوعی راه رفتن اسب

⊡ **قـۆرت تـێ خستن:** *[کنایە]* چـەت تـێ خسـتن؛ لەمپـەر و بـەرگر خسـتنە بـەرکار و بـارەوە ☰ چوب لای چرخ گذاشتن

**قۆرت تێ کەوتن:** *[کنایە]* چەت تێکەوتن؛ بەرگر هاتنە پێش کار و بار ☰ مانع روی آوردن

**قـۆرت دان:** ڕەت بـردن؛ پـا هەڵـکەفتن ☰ سکندری خوردن

**قۆرتانن** / qortanin/: چاوگ. لچ و لێو گرژ کردن؛ ناوچاو تاڵ کردن ☰ روی درهم کشیدن؛ اخم کردن

**قۆرتاوی** / qortawî/: ئاوەڵناو. قۆرتقۆرتاوی؛ قۆرت ـ قۆرت: ١. درێژی بە گرێ ٢. پڕ بڵندی و نزمی ٣. پڕ لە قووڵـکە و کۆسـت ☰ ١. بُلنـدِ گـرەدار ٢. پُرفراز و نشیب ٣. پُرچالەچوله

**قۆرت ـ قۆرت** / qort qort/: ☜ **قۆرتاوی**

**قۆرتقۆرتاوی** / qortqortawî/: ☜ **قۆرتاوی**

**قـۆرتم** / qortim/: نـاو. ١. چـۆرتم؛ بەسـەرهاتێ ناخۆش ٢. قورتمی کەڵک ٣. ☜ **قرتم-١** ☰ ١. پیشـامد نـاگوار ٢. کیسـەی گـردن پلیکـان ٣. ☜ **قرتم-١**

**قۆرتە** / qorte/: ☜ **قۆترە ـ١**

**قۆرج** / qorc/: ناو. ١. کـەمکۆڵ؛ تێخولـی شـینی گوێز ٢. ڕەوتی کلۆر بوونی ددان؛ کرمۆلی دیـان ☰ ١. پوست سبز گردو ٢. کرمخوردگی دندان

**قۆرچک** / qorçik/: ☜ **قۆچك ـ١**

**قۆرچکە** / qorçke/: ☜ **کۆچکە ـ١**

**قۆرچین** / qorçîn/: چاوگ. هەڵپچڕکاندنی گیـا ☰

کندن گیاه

**قۆڕخ**[1] / qorix/: ناو. قـۆڕخ: ١. دەخڵـی پـاوان ٢. بێشەی تایبەتی ٣. گەرماوی چۆڵ‌کراو لە بێگانـە ⇆ ١. مزرعەی خصوصـی ٢. بیشـەی اختصاصـی ٣. جمام قُرُق

**قۆڕخ**[2]: ئاوەڵناو. قـۆڕخ؛ قـۆڕغ؛ پـاوان؛ پـاوانکراو ⇆ قُرُق

▣ **قۆڕخ کردن**: پاوان کردن ‹سەروەرم! تۆ شەوت بۆ گریەی چاوانت قۆڕخ کـرد/ سـووتایت و ئەوسـاکە کازیوەت/ گوڵ شیعری خۆری گرت «شێرکۆ»› ⇆ قُرُق کردن

**قـۆردون** / qordun/: نـاو. زنجـیر یـان دەسـتەی سەعات ⇆ زنجیر یا بند ساعت

**قۆرزی** / qorzî/: نـاو. قوژبن؛ سووچ؛ گۆشە؛ سـیلە؛ کونج ⇆ گوشه

**قۆرغ** / qorig/: ئاوەڵناو. پاوان؛ قەدەغە ⇆ قُرُق

**قۆرقچی** / qoriqçî/: ناو. مەلێکی ڕەشی مل سـپی کە بە قەدەر پەپوسێمانەیەکە ⇆ پرندەای است

**قـۆرە** / qore/: نـاو. بەرسـیلە؛ پەسـیرە؛ پەرسـیلە؛ پەسیلە؛ بەسیلە؛ بسیرە؛ بێسـیرە؛ پێسـیرە؛ ژوور؛ ژێلـە؛ ژێلـێ؛ هالـە؛ هـاڵ؛ هالـێ؛ هاڵەژێلـە؛ سرەمۆک؛ هارسم؛ ترێی کاڵی سـەوز و تـرش ⇆ غوره

**قۆرەپیشـان** / qorepîşan/: نـاو. مـانگی گـەلاوێژ؛ مانگی پێنجەمی ساڵی هەتاوی ⇆ مُرداد ماه

**قۆرەخانـــە** / qorexane/: نـــاو. قۆرخانـــە: ١. کەل‌وپەلی نان و چا خواردن ‹دایکـم قۆرەخانـەی کێشا ناو حەوش› ٢. جبەخانە؛ جێگـای چـەک و تەقەمەنی ⇆ ١. بساط چای و غذا ٢. اسلحه‌خانه

**قۆرەقۆر** / qoreqor/: ناو. [پلار] قۆرەقۆڕ؛ بۆڵـەبۆڵ؛ پرتە و بۆڵە ‹کا کووڤی و کا ئەڤۆر، کا ئـەو دەنـگ و قۆرەقۆر/ کا شرینا کەوێ نێر، کا نێچیرڤان لە کوویە؟ «جگەرخوێن»› ⇆ قُرقُر

**قـۆرەمارانـە** / qoremarane/: نـاو. پەسـیرەمارانە؛ هاڵەمارانە ⇆ نوعی غوره

**قۆری** / qorî/: ناو. ١. قووری؛ چـادان؛ چایـدان ٢. گیشە؛ گرشە؛ گیای بە باقە لە سەر یـەک چنـراو ٣. خەرمانی شیشەتووتن ⇆ ١. قـوری ٢. بسـتەی گیاه روی هم چیـده ٣. سـاقەهـای بـرهم انباشـتەی توتون

**قۆریجـان** / qorîcan/: نـاو. خۆلـنجان؛ کۆلـنجان؛ قۆلنجان؛ قۆلیجان؛ قۆرینگان؛ خرندال؛ گیایەکـە بە ڕەنگی سووری تۆخ و بۆنی توند و خۆش و لق و لاسکی هێشوویەوە کە بۆ دەرمـان دەشـێ ⇆ قولنجان

**قۆرینگان** / qorîngan/: ☜ **قۆریجان**

**قۆریـە** / qor(i)ye/: ناو. ١. باقەگیای لە سەر یەک چنراو ٢. قۆری؛ قووری؛ چادان ⇆ ١. تودەی گیـاه بسته ٢. قوری

**قۆڕ**[1] / qoř/: ئاوەڵـناو. غۆڕ: ١. قێڕ؛ قێڕە؛ قێڕەگون؛ گون داچۆڕاوی پەنەماو ‹پادشاهی پسر بـە مکتـب داد/ وتی تـۆش کـەر نـەبی وەکـوو فـەرهاد!// لـوح سیمینش در کنار نهاد/ نەکوو قـۆڕی بکـا بـە شـەق ئوسـتاد! «مـەلا غـەفوور»› ٢. [پلار] شـرم ـ بـرم؛ کەترە؛ سووک و بێ‌بایەخ ‹ڕەنگە ئەگەر ئەودەم لـە سەر ئەم قسـە قۆڕانـە ڕۆیشـتبام، بمتوانیبـا ببم بـە نووسەرێکی گاڵتەچی «هەژار، چێشتی مجێـور»› ⇆ ١. فتقی ٢. لاطایل

**قۆڕ**[2]: پێرۆ. ← **زەنگ‌وقۆڕ**

**قـۆڕات** / qořat/: نـاو. خسـکە؛ خلیسـکە؛ کەسـخ؛ بنکی ئەستوور و خڕی گیا ⇆ پیاز؛ ریشەی غُـدەای گیاه

**قۆڕان** / qořan/: چـاوگ. چۆڕ نەمان؛ چۆڕبڕ بـوون ⇆ ته کشیدن (مایع)

**قۆڕانـدن** / qořandin/: چـاوگ. تێـپەڕ. //قۆڕانـدت؛ دەقۆڕێنی؛ بقۆڕێنە// قـۆڕانن؛ قووڕانـدن؛ قـووڕانن؛

قۆڕین؛ قۆڕنەی: ١. دەنگ دەرهاتنی ناو زگ ٢. هەرا کردنی سەگ لە ئێش پێگەیشتن ٣. بۆڕاندن؛ دەنگ هەڵدانی گا ☰ ١. قار و قور کردن شکم ٢. نالیدن سگ از درد ٣. ماغ کشیدن گاو

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەقۆڕاندن

**قۆڕانن / qořanin/:** ☜ **قۆڕاندن**

**قۆڕبێژ / qořbêj/:** ئاوەڵناو. [پەلار] نەزانەدوو؛ کاوێژکەر ☰ ژاژخا

**قۆڕخ / qořix/:** ☜ **قۆرخ**

**قۆڕخانە / qořxane/:** ☜ **قۆرەخانە**

**قۆڕغ[1] / qořiğ/:** ناو. قۆڕخ؛ گۆلاوی پڕ لە زەمەند ☰ برکەی طبیعی

**قۆڕغ[2]:** ☜ **قۆرخ[2]**

**قۆڕقۆڕە / qořqoře/:** ناو. ١. مەزرەقی ناوکۆڵدراو کە لە سووڕاندا بۆڕەی دێ ٢. ☜ **قۆڕیانەزەردە** ☰ ١. گردنای کاوک ٢. ☜ **قۆڕیانەزەردە**

**قۆڕک / qořik/:** ناو. ١. پاتک؛ پشتەمل؛ پشت ئەستۆ ٢. سمت؛ سمتۆڵ؛ پاشل؛ لاقنگ ٣. خالیگە؛ برک؛ کەلەکە؛ هالیگا ☰ ١. قفا؛ پُشت گردن ٢. باسن ٣. تُهیگاه

**قۆڕگ / qořig/:** ناو. قلێچکە؛ کلێچە؛ بزدوو ☰ استخوان دُنبالچه

**قۆڕن / qořin/:** ناو. سووچ؛ خەتا؛ تاوان ☰ گُناه

**قۆڕنازک / qořnazik/:** ناو. بنی ئانیشک ☰ ته آرنج

**قۆڕنەی / qořney/:** ☜ **قۆڕاندن**

**قۆڕە[1] / qoře/:** ناو. ١. [پەلار] دەعیە و دەمار ٢. تاعوونی ڕەشەوڵاخ ٣. چۆڕە؛ دلۆپ ☰ ١. تکبُر ٢. طاعون ستور ٣. شره؛ قطره

⊡ **قۆڕە لێ برین:** بین پێوەنانی گۆزە ناو و چۆڕە لێ برینی ☰ هورت کشیدن تا ته

**قۆڕە لێ دان:** تووشی بەڵا هاتنی ڕەشەوڵاخ ☰ دچار حادثه شدن ستور

**قۆڕە[2]:** دەنگەناو. ١. قرە؛ قرەقر؛ دەنگی ناو زگ ‹کورە چۆن حەوت ڕۆژ ڕاوەستم؟ هەر ئێستا ئەوە لە برسان قۆڕەی زگمە، چوار فلس شک نابەم بیدەم بە نانێک! «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. بۆڕە؛ دەنگی بەرزی ڕەشەوڵاخ ☰ ١. قاروقور شکم ٢. ماغ گاو

**قۆڕەدەماغ / qoředemax/:** ئاوەڵناو. [پەلار] قۆڕەدەمار؛ قۆڕەدەماغ؛ لووتبەرز؛ بادیهەوا؛ بەفیز ☰ مغرور؛ مُتکبر

**قۆڕەدەماخی / qoředemaxî/:** ناو. [پەلار] خۆپەسندی؛ بادیهەوایی ☰ خودپسندی؛ تکبّر

**قۆڕەدەمار / qoředemar/:** ☜ **قۆڕەدەماخ**

**قۆڕەدەماغی / qoředemağî/:** ناو. [پەلار] قۆڕەدەماری؛ قۆڕەدەماخی؛ لووتبەرزی؛ بادیهەوایی ‹هەباساغا ... نیمچە پادشایەک بوو. هەوەڵین ئاغای کە ببوە یاریکاری شۆرش، ئەو بوو، بەڵام هیچ خووی قۆڕەدەماغی ئاغایانەی نەبوو «هەژار، چێشتی مجێور»›. هەروەها: **قۆڕەدەماغ** ☰ غرور؛ تکبر

**قۆڕەقۆڕ[1] / qořeqoř/:** ناو. ١. قرە؛ قۆڕەی زگ ٢. دەنگی لە پەستای ڕەشەوڵاخ ٣. [پەلار] بۆڵەبۆڵ؛ پرتە و بۆڵە ☰ ١. قرـ قر شکم ٢. ماغ پیاپی گاو ٣. غرولند

**قۆڕەقۆڕ[2]:** ئاوەڵکار. گەلاوگەل؛ لارەلار ‹قۆڕەقۆڕ دەڕوا› ☰ لنگ ـ لنگان

**قۆڕی / qořî/:** ناو. ١. غۆڕی؛ گونپەنەماوی؛ گونشۆڕی ٢. ☜ **قۆڕیانەزەردە** ٣. قۆری؛ چادان ☰ ١. فتق بیضه ٢. ☜ **قۆڕیانەزەردە** ٣. قوری

**قۆڕیات / qoř(i)yat/:** ناو. ١. [پەلار] فشقیات؛ کار و قسەی سووک و بێبایەخ ٢. جۆرێ هەوای گۆرانی ☰ ١. لاطائلات ٢. نوعی آهنگ موسیقی

**قۆڕیانە / qořyane/:** ☜ **قۆڕیانەزەردە**

**قۆڕیانەزەردە / qořyanezerde/:** ناو. قۆڕقۆڕە؛ قۆڕی؛ قۆڕیانە؛ قۆڕییەزەرد؛ قۆڕییەزەردە؛ قۆڕلە؛ زەردەقۆڕە؛ زەردەقۆڕ ☰ آفتابپرست

**قۆڕیایوه / qoŕyaywe/**: چاوگ. قۆڕاندن؛ بۆڕانـدن (گا) ماغ کشیدن (گاو)

**قۆڕیلە / qoŕîłe/**: ☜ قۆڕیانەزەردە

**قۆڕین / qoŕîn/**: ☜ قۆڕاندن

**قۆڕییەزەردە / qoŕîyezerde/**: ☜ قۆڕیانەزەردە

**قۆز¹ / qoz/**: ناو. قۆزە؛ قفە؛ کۆکە سُرفه

**قۆز²**: ئاوەڵناو. ١. پێکـەوتوو؛ جوانخـاس؛ جـوان و لەبار ٢. کۆم؛ داچەماو ٣. قۆڕەدەماخ؛ لووتبەرز ١. خوش‌تیپ ٢. کوژ ٣. مُتکبر

▣ **قۆز بون**: داهاتنەوە؛ چەمانەوە خمیدن

**قۆزاخە / qozaxe/**: ناو. ١. پارچەیەک لە شـتێکی بەش کراوی هێشتا جیاوەنەکراو ‹هەنارەکەی چوار قۆزاخە کرد و داینـا› ٢. گۆزک؛ قۆزڵاخـە؛ قـولاخ؛ قـۆلاخ؛ قـۆزلاخ؛ خـۆز؛ شـرش؛ بـەری وشـک و پشکووتووی بـڕێ گیـا (وەک پـەموو) ٣. کـەلوو؛ پەمۆی پێچراو بـۆ ڕسـتن ٤. کـەلووی نیسـک و نۆک و پاقلە ٥. کەلوو؛ تەتڵەی کرمی هەورێشـم ١. قسمتی از شیء قسمت شده و هنوز کاملاً جـدا نشده ٢. آغنده؛ غـوزەی پنبـه و مانـند آن ٣. پنبـەی آمادەی ریسیدن ٤. پوشش دانـەی نخـود و عـدس و لوبیا ٥. پیلەی کرم ابریشم

**قۆزاندن / qozandin/**: چاوگ. وە قۆزە خسـتن به سرفه آوردن

**قۆزای / qozay/**: چاوگ. قۆزین؛ کۆکین؛ کـۆخین سُرفه کردن

**قۆزایی / qozayî/**: ناو. زۆپـایی؛ قـیتی؛ گـتـایی برجستگی

**قۆزتنەوە / qozt(i)newe/**: ☜ قۆستنەوە

**قۆزتەی / qoztey/**: چاوگ. قۆستنەوە قاپیدن

**قۆزک / qozik/**: ناو. قەڵماسک؛ قۆچـەقانی جـیر؛ بەرەقانی لاستیق فلاخن لاسـتیکی؛ تیروکمـان بچەها

**قۆزڵاخ / qozłax/**: ☜ قۆزڵاخە

**قۆزڵاخە / qozłaxe/**: ناو. قۆزلاخ؛ قۆزاخەی پەموو غوزەی پنبه

**قۆزڵەمینە / qozłemîne/**: نـاو. چێشـتێکە از غذاها

**قۆزنای / qoznay/**: چاوگ. خستنە کۆکەوە بـه سرفه آوردن

**قۆزە / qoze/**: ناو. ١. کۆخە؛ کۆکـە؛ قفـە ٢. ☜ قۆزەقڕواق ١. سُرفه ٢. ☜ قۆزەقڕواق

**قۆزەبەرد / qozeberd/**: ☜ قرێژەبەرد

**قۆزەڕەشە / qozeŕeşe/**: نـاو. قفەڕەشە؛ کۆخەڕەشە سیاەسُرفه

**قۆزەقڕواق / qozeqiŕwaq/**: ناو. قۆزە؛ کەز؛ کـەفز؛ کـەفزە؛ قـەبزە؛ کەڤـس؛ کـووز؛ خورپەجنـە؛ خورپەجندۆکە؛ کەزی؛ کـەژاو؛ قـەوزاق؛ قـەوزاخ؛ قـەوزەقورواق؛ قەوزەقوڕباقـە؛ گووبـۆق؛ گـاوەک؛ ناوی گشتی ئەو ڕووەکانە وا زۆرتر لە جێی شـۆدار و تاریک یان لە ئـاوی مەنـددا دەڕوێـن خـزه؛ جل‌وزغ

**قـۆزەقـورواق / qozequrwaq/**: نـاو. جلشـین؛ گاوەک؛ کەژاو؛ قەوزە خزه

**قۆزی / qozî/**: ناو. ١. جـوانی؛ شـۆخوشـەنگی ٢. کـونج؛ سـووچ و سـیلە ٣. پشـتچـەماوەیی ٤. دۆخی کۆک و پۆشتە بـوون ٥. چێشـتی پـلاو و گۆشـت ١. برازنـدگی ٢. زاویـه ٣. کـوژی ٤. شیکپوشی ٥. خوراک چلوگوشت

**قۆزیان / qozyan/**: ☜ قۆزین-١

**قۆزین / qozîn/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //قۆزیت؛ دەقـۆزی؛ بقۆزە// ١. قۆزیـان؛ قفـین؛ کـۆخین؛ کـۆکین ٢. چەمینەوەی پشت ١. سُرفه کـردن ٢. خمیـدن پشت

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەقۆزین

**قۆزیەتی / qozyetî/**: ناو. قۆزی؛ جوانی و شـەنگی برازندگی

**قۆزێنی / qozênî/**: ناو. جەنگەی جوانی و لاویتی ☰ عنفوان جوانی و زیبایی

**قۆژباشی / qojbaşî/**: ناو. پلەگۆشتی برژاو ☰ چنجە

**قۆژیانە / qojyane/**: ناو. قۆڕیانە؛ خمخمۆک؛ خەمەگرو ☰ بُزمجە

**قۆستنەوە / qost(i)newe/**: چاوگ. تێپەڕ. //قۆستەوە؛ دەقۆزییەوە؛ بقۆزەوە// قۆزتنەوە: ١. لە حەوا گرتنەوە ٢. هەل بە دەرفەت زانین ☰ ١. از هوا قاپیدن ٢. از فرصت استفادە کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەقۆستنەوە

**قۆسە / qose/**: ناو. دەمنەسگار؛ مۆدنە؛ باسک؛ دارجگەرە ☰ چوب سیگاری

**قۆشپاب / qoşpab/**: ☜ قۆشقاپ

**قۆشقاب / qoşqab/**: ☜ قۆشقاپ

**قۆشقاپ / qoşqap/**: ناو. قۆشپاب؛ قۆشقاب؛ گۆشقاب؛ گۆشپاق: ١. دەوری؛ قاپی پەل ٢. نالبەکی؛ ژێرپیالە ☰ ١. بُشقاب ٢. نعلبکی

**قۆشقە / qoşqe/**: ئاوەڵناو. بەدفەڕ؛ جووتقۆشە؛ قۆشە ☰ شوُم

**قۆشمانێ / qoşmanê/**: ناو. جریتان؛ جلیتبازی؛ جریدانێ؛ تەڕاتێن ☰ جَوَلان اسب در میدان

**قۆشمە / qoşme/**: ئاوەڵناو. ١. زرنگ؛ زیتەڵ ٢. بێئاکار؛ بێفەڕ ٣. حەنەکچی؛ گاڵتەچی ☰ ١. زرنگ ٢. بی‌اخلاق ٣. لودە

**قۆشە[1] / qoşe/**: ناو. ١. وردەپووڵ ‹هەمبوو نەمبوو چوار قۆشە/ دام بە بزنێکی پۆشە «بەردەشانی»› ٢. خالی سپی لە توێڵی حەیوان ٣. جووتشەش؛ زاراوەیەکە لە نەردێندا ‹ئەو هەر قۆشە نیشت، من یەک بیم نەسیب «مەولەوی»› ☰ ١. پول خُرد ٢. خال سفید بر پیشانی دام ٣. جُفت‌شش

**قۆشە[2]**: ئاوەڵناو. ١. بەدودم؛ بەدفەڕ؛ نەحس ٢. توێڵ سپی (ئاژەڵ) ☰ ١. شوم ٢. پیشانی سفید (دام)

**قۆشەن / qoşen/**: ناو. سپا؛ ئۆردوو ‹تەن لەرزان بە جەور باد سوب تۆفان/ پێشڕەو قۆشەن شەوق شکۆفان «بێسارانی»› ☰ قشون؛ ارتش

**قۆشەنیان / qoşen(i)yan/**: ناو. گریوەغار؛ غارغاێنی ئەسپ سواران ☰ مسابقەی اسبدوانی

**قۆغ / qoğ/**: ئاوەڵناو. چەمیو؛ کۆم؛ پشتچەمیو ☰ کوژپشت

**قۆف / qof/**: ئاوەڵناو. ١. پشتچەمیاو ٢. کۆڵ؛ بێقامک ☰ ١. خمیدەپشت ٢. بی‌انگشت

**قۆفر / qofir/**: ناو. زەوی بەبەردی وا کە گاسن لێی گیر بکا ☰ کشتزار سنگلاخی

**قۆق[1] / qoq/**: ناو. ١. سەر؛ یەکەی ژماردنی ئاژەڵ ٢. کەللەی ئاژەڵ بە کولاوی ☰ ١. رأس؛ واحد شمارش دام ٢. کلەی پُختەی دام

**قۆق[2]**: ئاوەڵناو. ١. پشتدەرپەڕیو ٢. چاولەوەڕێن؛ چاوحیز ☰ ١. کوژپشت ٢. نظرباز؛ چشم‌چران

**قۆقز / qoqiz/**: ئاوەڵناو. ١. زەق؛ زۆپ؛ دەرپەڕیو ‹بە دەستێکی تەوێڵی قۆقزی دەسری› ٢. کۆم؛ کۆز ‹ئاوێنەی قۆقز› ☰ ١. برجستە ٢. خمیدە

**قۆقزایی / qoq(i)zayî/**: ناو. زۆپی؛ زەقی؛ دەرپەڕیوی ‹قۆقزایی بەرمل› ☰ برآمدگی؛ برجستگی

**قۆقک / qoqik/**: ناو. کالانەی چاو؛ قوولکەی چاو ☰ حدقەی چشم

**قۆقلاندن / qoq(i)landin/**: چاوگ. ١. کون/ کونا کردن ٢. لێکردنەوە و دەرهێنانی پارچەیەک لە شتێک ‹ئەم ئی چاڤێن دژمنان بقۆقلینن› ☰ ١. سوراخ کردن ٢. درآوردن

**قۆقلین / qoq(i)lîn/**: چاوگ. کون/ کونا بوون ☰ سوراخ شدن

**قۆقمیش / qoqmîş/**: ناو. گیایەکی بەهارییە لە دۆکلیوی دەکەن ☰ گیاهی آشی

**قۆقنای / qoqnay/**: چاوگ. قووقاندن ☰ خواندن خروس

**قۆقـۆ / qoqo/**: ئاوەڵـناو. [پـلار] زلحـۆل؛ تـەژە و زەبەلاح ≡ لندهور

**قۆقە / qoqe/**: ناو. سەتڵی دارین ≡ دلو چوبین

**قـۆقی / qoqî/**: نـاو. چـەمیاوی؛ چـەمیاگی؛ پشتدەرپەڕیوی ≡ قوزی؛ پشت خمیدگی

**قۆل١ / qol/**: ناو. دەرو؛ دەرەتـان؛ ڕێگـەی دەربـاز بوون ≡ مفر

**قۆل٢**: ئاوەڵناو. ١. بێ‌کلک؛ جووچکە قرتیاگ ‹پشی قۆل› ٢. [پلار] حۆل؛ درێژی ناحەز ≡ ١. بی‌دُم ٢. دراز بی‌قواره

**قۆلاج / qolac/**: ☜ **قولانج**

**قۆلاچ / qolaç/**: ☜ **قولانج**

**قۆلاچە / qolaçe/**: ☜ **قالۆنچە**

**قۆلان١ / qolan/**: چاوگ. دابڕ کـردن؛ دەسـت بـە سەردا گرتن؛ شتێک بەبێ ڕەزای خاوەنی بـردن ≡ تصاحُب کردن

**قـۆلان٢**: نـاو. ١. گوڵـەنگی جلـک بـۆ جـوانی ٢. تەنگ؛ تەنگەی ولاخ؛ قایشی توند کردنی کورتان لە ژێر سکی ولاخ ≡ ١. منگولەهای زینتـی ٢. نـوار پهن تنگەی ستور

**قۆلانجە / qolance/**: ☜ **قالۆنچە**

**قۆلانچە / qolançe/**: ☜ **قالۆنچە**

**قۆلانچـەژارە / qolançejare/**: نـاو. قولانچـەژارە؛ قولانچەنەخشـینە؛ قۆلەنەخشـینە؛ قۆلـەژاردارە؛ قۆلانچەنەخشـینە؛ ئالـی‌پلـنگ؛ حنـدرحۆ؛ داردوولەق ≡ الاکلنگ

**قۆلانچەنەخشـــینە / qolançenexşîne/**: ☜ **قۆلانچەژارە**

**قـۆلانی / qolnî/**: نـاو. گـولاو؛ عـەتراوی گـول ≡ گلاب

**قۆلتخ / qoltix/**: ☜ **قوڵتخ**

**قۆلچاغە / qolçağe/**: ناو. جۆرێ بەرەڵبێنە کە لە سنگەوە تا داوێن دادەپۆشێ ≡ نوعی پیشبند بلند

**قۆلۆچ / qoloç/**: ناو. شاخ؛ سترۆ ≡ شاخ حیوان

**قۆلە / qole/**: ناو. ١. گوێل؛ گوێر؛ قـولاج؛ قـولانج ٢. ☜ **قالۆنچە** ≡ ١. باژ؛ فاصلەی میان دو انگشت سبابه و شست ٢. ☜ **قالۆنچە**

**قۆلەژاردارە / qolejardare/**: ☜ **قۆلانچەژارە**

**قۆلەقۆل / qoleqol/**: ئاوەڵکار. [پلار] هەنگاوی بەرز هاویشتن و لار و گێر ڕۆیشتن ≡ گام بلند برداشتن و کج و مُعوَج راه رفتن

**قۆلێ / qolê/**: ئاوەڵناو. [پلار] بـەرزی ناحـەز ≡ دراز بی‌قواره

**قۆڵ١ / qoł/**: نـاو. ١. ساکول؛ زەند؛ ئـەو بەشـە لـە دەست کە لـە نێـوان مەچـەک و ئانیشـکدایە ٢. باڵ؛ لە ئانیشک بەرەژوور تا شان ٣. سەردەسـت؛ دەرباڵ؛ جومگەپۆش لە کراس و کەوا ٤. کۆمەڵێ لە خەڵک کە بۆ شەڕ یان بۆ کارێ دەنێردرێن ٥. لاداری عەڕابەی وەرزێـران ٦. ئێشـک؛ کێشـک؛ پاسەوانی ٧. یەکەی بژاردنی بەلال ‹یـەکێ چـوار قۆڵ بەلالمان خواردا› ≡ ١. ساعد ٢. بازو ٣. آسـتین ۴. گروه ۵. بـازوی گـاری کشـاورزی ۶. نگهبـانی ۷. واحد شُمارش بلال

⊡ **قۆڵ لێ هەڵماڵین**: ☜ **قۆڵ هەڵماڵین**

**قـۆڵ مـاچ کـردن**: دەسـت مـاچ کـردن ≡ دسـت بوسیدن

**قۆڵ (لێ) هەڵکردن**: ١. هەڵپێچانی قۆڵی کراس و کـەوا ٢. [کینایە] ئـەنگوچک بـە لادا کـردن؛ تەیاری کارێ بوون ‹قۆڵی لێ هەڵـکەین بچینـە مەیدان/ تا کورد بەرینە ڕیزی میللەتان «بێکەس»› ≡ ١و٢. آستین بالا زدن

**قۆڵ هەڵماڵین**: قـۆڵ لـێ هەڵمالـین: ١. قـۆڵ هەڵکردن ٢. [کینایە] خۆ ئامادە کردن بۆ کـارێ ≡ ١و٢. آستین بالا زدن

**قۆڵ٢**: ئاوەڵناو. ١. ئەستوور؛ قەبە؛ قـەوی ٢. قولـە؛ بێ‌کلک ≡ ١. کُلُفت؛ ستبر ٢. دُم‌بریده

**ـ قۆلا / qoła/**: پاشەوشە. ڕێک؛ لەبار؛ شیاو ‹ئەو پینە لێت داوە، هێندێک ناقۆلایە؛ کابرایەکی ناقۆلام تووش بووە› ☰ ـ جور

**قۆلاخ / qołax/**: ☜ **قۆزاخە ـ٢**

**قـۆلایی / qołayî/**: نـاو. ئەسـتووری؛ قەڵـەوی ☰ کُلُفتی؛ ستبری

**قۆڵبـەبازن / qołbebazin/**: ناوەڵـناو. خرخاڵـدار؛ بازنە لە دەست ‹کوانێ ئـەو ڕۆژەی کـە سـەرچۆپیم دەگرت بانگم دەکرد/ دۆم دەوێ، دۆی قۆڵبـەبازن و پەنجەنەخشینم دەوێ «هێمن»› ☰ خَلخالدار

**قۆڵبەس / qołbes/**: ☜ **قۆڵبەست**

**قۆڵبەست / qołbest/**: ئاوەڵناو. قۆڵبەس؛ قۆڵبەستە؛ قۆڵپێچ؛ دەست لە پشتەوە بەستراو ☰ دستگیر؛ دستبسته

⊡ **قۆڵبەست کردن**: باڵبەست کـردن ☰ دسـتگیر کردن

**قۆڵبـەسـتکراو / qołbestk(i)raw/**: ئاوەڵـکار. باڵبەستە؛ قۆڵبەستە ☰ کتبسته

**قۆڵبەستە / qołbeste/**: ☜ **قۆڵبەست**

**قۆڵبەن / qołben/**: ☜ **قۆڵبەند**

**قۆڵبەنـد / qołbend/**: نـاو. قۆڵـبەن؛ بـازیبەنـد؛ زەنبەری باسک ☰ بازوبند زینتی

**قۆڵپێچ / qołpêç/**: ☜ **قۆڵبەست**

**قۆڵت / qołt/**: نـاو. قـورت: ١. بـەلا و چـۆرتم ٢. چالایی لە زەمیندا ☰ ١. پیشامد ناگوار ٢. چاله

**قۆڵتاس / qołtas/**: ناو. ئاوگەردان؛ مەلاقەی گەورە ☰ آبگردان

**قۆڵچاخ / qołçağ/**: ناو. زەندووک؛ مەچەکپێچ ☰ ساعدبند هنگام کار

**قۆڵچاغـە / qołçağe/**: نـاو. قۆڵـبەند؛ قۆڵـەوانە؛ زەنبەری باسک ☰ بازوبند

**قۆڵچمـاغ / qołç(i)mağ/**: ئاوەڵـناو. شـەلاتی؛ ساختەچی؛ خاوەئەستێن ☰ شارلاتان

**قـۆڵچی / qołçî/**: نـاو. پیـاوی دارۆغـە؛ پۆلیسـی ناوشار ‹مووچەی گزیر و سـەرکار/ بەشـی قۆڵـچی، قەراخ شار «قانع»› ☰ پُلیس شهری

**قۆڵخ / qoł(i)x/**: ☜ **قولاخە**

⊡ **قـۆڵخ دان**: قولاخە دان؛ پەیا بوون لە نادیـارەوە ☰ از دور پیدا شدن

**قۆڵڕاکێش / qołřakêş/**: ناو. باڵڕاکێش؛ چاوساغی مرۆی کوێر ☰ عصاکش

**قۆڵغە / qołğe/**: ناو. سەکۆ؛ بەرزاییەک لە ماڵدا بۆ دانیشتنی هاوینان ☰ سکو

**قۆڵکان / qołkan/**: ناو. ئاگرپژێن؛ گڕکان؛ بورکـان ☰ آتشفشان

**قۆڵگیر / qołgîr/**: ناو. نەخۆشییەکی شان و پیلـی ولاخ ☰ نوعی بیماری دام

**قۆڵمە / qołme/**: نـاو. ئێسکی بەلەک ☰ استخوان ساق

**قـۆڵنج / qołinc/**: نـاو. کۆڵـنج؛ ڕەپ بـوونی ماسـوولکەی لـەش (بەتایبـەت پشـت و مـل) ☰ اسپاسم عضلانی (بویژه پُشت و گردن)

⊡ **قۆڵنج تەقاندن**: ☜ **قۆڵنج شکاندن**

**قۆڵنج شکاندن**: قۆڵنج/ کۆڵنج تەقاندن؛ شێلانی توندی ناوشان و پشت ☰ ماساژ دادن پشت و شانه

**قۆڵنج کردن**: ئێشانی پشـت و نـاو شـان ☰ درد گرفتن پشت و شانه

**قۆڵنجان / qołincan/**: ☜ **قۆریجان**

**قۆڵنجشکێن / qołincş(i)kên/**: ناو. کەسێ کە باش ناوشان و پشتی ئێشاو بشێلێ ☰ ماساژور

**قۆڵنگە / qołinge/**: ☜ **قولنگە**

**قۆڵە / qołe/**: پێرۆ. ← **قەرزوقۆڵە**

**قۆڵەکراس / qołek(i)ras/**: ☜ **ئاسین**

**قۆڵەمیر / qołemîr/**: ناو. کەسێ کە کردەوەی لـە میران دەچێ ☰ کسی کـه رفتـارش مانند امیـران

است

**قۆڵەوانە / qołewane**/: ناو. بازووبەند ☰ بازوبند

**قۆڵهەڵماڵاو / qołhełmaław**/: ☜ **قۆڵهەڵماڵراو**

**قۆڵهەڵماڵراو / qołhełmałraw**/: ئاوەڵناو. قۆڵهەڵماڵاو؛ قۆڵهەڵماڵیاو؛ لنگهەڵکراو: ١. ئەنگوچک بەلادا کردوو ٢. *[کینایە]* تەیار بۆ کار ☰ ١. آستین بالازده ٢. آمادەی کار

**قۆڵهەڵماڵیاو / qołhełmałyaw**/: ☜ **قۆڵهەڵماڵراو**

**. قۆڵی / qołî-**/: پاشگر. ـ دانەیی (پێڕای هاوکاری) ‹قوڕ بپێویٚ دوژمنی سێقۆڵی بۆ دواڕۆژی خۆی/ تەخت و تاراجی دەرێنێ، لاوی کوردی هۆشیار «قانع»› ☰ ـ تایی

**قۆڵیجان / qołîcan**/: ☜ **قۆریجان**

**قۆم / qom**/: ☜ **قەوم**

**قۆمان / qoman**/: ☜ **قەومان**[1]

**قۆماندن / qomandin**/: ☜ **قەوماندن**

**قۆمانن / qomanin**/: ☜ **قەوماندن**

**قۆمایەتی / qomayetî**/: ☜ **خزمایەتی**

**قۆمبەلە / qombele**/: ☜ **قومبەرە**

**قۆمرغانە / qomirğane**/: ناو. ١. کۆڕی پڕ لە هەرا و هوریا ٢. شوێنی لادان و مانەوە ☰ ١. مجلس پُرهیاهو ٢. اُتراقگاه

**قۆمز / qomiz**/: ناو. بەردەلان؛ ڕێخەلان؛ ڕێخناخ ☰ سنگلاخ

**قۆمک / qomik**/: ناو. کەشکەژنۆ؛ پێشەی زرانی؛ کەشکەزرانی ☰ کشکک

**قۆمنای / qomnay**/: چاوگ. قەوماندن ☰ حادثە آفریدن

**قۆمە / qome**/: ☜ **قەومە**

**قۆمەتە / qomete**/: ناو. کۆگا؛ کۆمە ☰ تودە

**قۆمەشارەکێ / qomeşarekî**/: ناو. چاوشارەکێ؛ چاوشارکێ ☰ قایم‌موشک

**قۆمیان / qomyan**/: ☜ **قەومان**[1]

**قۆمیای / qomyay**/: چاوگ. قەومان ☰ روی دادن (اتفاق ناگوار)

**قۆمین / qomîn**/: ☜ **قەومان**[1]

**قۆن / qon**/: ناو. شەقۆن؛ کاری شاخ وەشاندن ☰ عمل شاخ زدن

**قۆناخ / qonax**/: ☜ **قۆناغ**

**قۆناخە / qonaxe**/: ☜ **قۆنداخە**

▣ **قۆناخە کردن**: ☜ **قۆنداخە کردن**

**قۆناخەپێچ / qonaxepêç**/: ☜ **قۆنداخەپێچ**

**قۆناغ / qonağ**/: ناو. قۆناخ: ١. یەک ڕۆژە ڕێ ٢. ماڵی زۆر بەمیوان و میوانڕاگر ‹قازی کە ماڵەکەی قۆناغی میوانانی ڕووس بوو، توانی نێوانی حیزب و ڕووسان خۆشتر کا و دەمانتوانی بە ڕاشکاوی کار بکەین «هەژار، چێشتی مجێور»› ٣. داری خوارەوەی تفەنگ ٤. بابۆڵەی ساوا تێوە پێچان ٥. ڕووداوی مێژوو ‹د ناڤ قۆناغێ دیریکیدا› ٦. گەڕ؛ خول ‹هەموو پرسیار و جوابەکانم لە بیر نەماون؛ بەلام لە جوابی ئەم پرسیارەدا کە: ئایا ئەدەبیاتی کوردی چەند قۆناغی بڕیوە و ئێستا لە کام حالدایە؟ گوتم: ... «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ ١. یک روزه راه ٢. خانەی مهمان‌پذیر ٣. قُنداق تفنگ ۴. قُنداق بچه ۵. حوادث تاریخی ۶. مرحله

**قۆناغ . قۆناغ / qonağ qonağ**/: ئاوەڵکار. پلە بە پلە؛ هەنگاو لە دووی هەنگاو ‹ئەوەی هەور پەڕە دەکا و دەیتارێنێ/ قۆناغ ـ قۆناغ، ئاقارـ ئاقار/ هەر خۆمانین «پەشێو»› ☰ مرحله به مرحله

**قۆناغە / qonağe**/: ☜ **قۆنداخە**

**قۆنتاخ / qontax**/: ☜ **قۆنداخە**

**قۆنجر / qoncir**/: ناو. دیوێکی گچکە و تەنگەبەر و تاریک ‹ئەم خانووە پڕ مەینەت، ئەم قۆنجرە ڕووخاوە/ چوارچێوەیی ناقایم، نێوی چییە؟ دونیایە! «ئاوات»› ☰ اتاق تنگ و تاریک

**قۆنداخ / qondax/:** ☜ **قۆنداخە**

**قۆنداخە / qondaxe/:** ناو. قۆناخ؛ قۆناخە؛ قۆناغە؛ قۆناغ؛ قۆنتاخ؛ قۆنداخ؛ قۆنداغ: ١. قاو؛ قوناخە؛ بەشی پاشەوەی تفەنگ کە لە دار یان ماکێکی سووک و پتەوە ٢. قومات؛ قوماتە؛ بابۆڵەی ساواپێچ ☗ ١. قُنداق تفنگ ٢. قُنداق بچە

⊡ **قۆنداخە کردن:** قۆناخە کردن؛ بابۆڵەپێچ کردنی منداڵ ☗ قُنداق کردن بچە

**قۆنداخەپێچ / qondaxepêç/:** ناو. قۆناخەپێچ: ١. زارۆی دە بابۆڵە پێچراو ٢. بەنی بابۆڵەی ساواپێچ ☗ ١. بچەی در قُنداق پیچیدە ٢. نخ قُنداق‌پیچ

**قۆنداغ / qondağ/:** ☜ **قۆنداخە**

**قۆندرە / qond(i)re/:** ☜ **قۆندەرە**

**قۆندەرە / qondere/:** ناو. قۆندرە؛ قۆنگرە: ١. کەوشی بەپاژنە ‹گەرچی ئەیشێلی بە زەبری قۆندەرە و پێلاوەکەت/ قەت بە دڵڕەق باست ناکەم، نایزڕێنم ناوەکەت «هەردی»› ٢. هەڵبەزی ئاو لە نێرینەی چەمدا ☗ ١. کفش پاشنەدار ٢. حالت ورجستن آب در شیب رودخانە

⊡ **قۆندەرە کردن:** ١. هەڵبەزینی ئاو لە ناو چەمی خوڕدا ٢. قوڕی زۆر بە پێڵاوەوە لکان ٣. دروست کردنەوەی پێڵاو ☗ ١. ورجستن آب در شیب رودخانە ٢. گِل زیاد بر کفش چسبیدن ٣. کفّاشی کردن

**قۆنگرە / qong(i)re/:** ناو. ١. قۆنگەرە؛ برجی سەر قەڵا ٢. ☜ **قۆندەرە** ☗ ١. کُنگرە؛ بُرج بالای قلعە ٢. ☜ **قۆندەرە**

**قۆنگەرە / qongere/:** ☜ **قۆنگرە ـ١**

**قۆنەقۆن / qoneqon/:** ناو. *[پلار]* لەش‌گرانی؛ تەمەڵی ☗ تنبلی؛ سُستی

**قۆنیاغ / qonyağ/:** ناو. کونیاک؛ جۆرێ خواردنەوەی ئەلکولییە لە شەراوی سپی بەرهەم دێ ☗ کُنیاک

**قوو / qû/:** ناو. ١. قاو؛ بانگی بە توند ٢. باڵندەیەکی سەر ئاوە لە تۆرەمەی مراوی و لە هەموویان گەورەتر، ملی درێژ و باریکە، نێر و مێ یەک ڕەنگە، ڕەش و سپی هەیە، لە سەر عەرز هێلانە دەکا، چەن جۆرە: بچووک، بێدەنگ و گەورە ٣. دەجاجە؛ تایێر؛ وێنەیەکی ئاسمانییە لە نیوەی باکووریی زەویدا ☗ ١. بانگ ٢و٣. قو

**قووپاو / qûpaw/:** ☜ **قوپاو**

**قووپک / qûpik/:** زۆپایی لە ناو تەختاییدا ☗ برجستگی میان همواری

**قووت[1] / qût/:** ناو. قوویت: ١. ڕەوتی پاروو لە گەروو چوونە خوار ٢. زەواد؛ بژیو ‹لە ڕووت‌وقووتی وەک من ڕوو مەپۆشە/ کە وەسڵی تۆیە قووتی عاشقی ڕووت «نالی»› ☗ ١. بلع ٢. قوت؛ مایەی زندگی

⊡ **قووت چوون:** ١. قووت دران؛ لە گەروو چوونە خوار ٢. *[کنایە]* وەرگیران؛ هەڵگیران؛ قەبووڵ کران ☗ ١. بلعیدە شدن ٢. پذیرفتە شدن

**قووت دان:** بە گەرووداا بەڕێ کردن ‹قووتی دا زستان هەچی بوو، قووتی حەیوان و بەشەر/ کا لە کادێن بوو قوتار و گیا لە قۆریە و گیشەدا «ئاوات»› ☗ بلعیدن

**قووت دران:** ☜ **قووت چوون ـ١**

**قووت کردن:** قووت دان ☗ بلعیدن

**قووت[2]:** ناوەڵناو. قوویت: ١. ڕووت؛ ڕویس؛ پەتی ٢. نوقم؛ نخرۆ؛ بناو ☗ ١. لُخت ٢. غرق

⊡ **قووت کردن:** ١. ڕووت کردنەوە ٢. نوقم کردن؛ بن ئاو خستن ☗ ١. لُخت کردن ٢. زیر آب کردن

**قووتان / qûtan/:** ناو. کەڵک؛ سەقاو؛ ماسی‌چنە؛ مەلێکە ڕاوە ماسی دەکا و قورتمی هەیە ☗ پلیکان

**قووتدراو / qûtd(i)raw/:** ناوەڵناو. دە گەروو هاوێژراو ☗ بلعیدە شدە

**قوته**[1] / qûte/: ناو. ١. کۆخە؛ قۆزە؛ قفە ٢. توانای قووت دان ٣. قوولکە؛ چاوانە؛ چاڵ ☰ ١. سُرفە ٢. یارای بلعیدن ٣. گودال

**قوته**[2]: ئاوەڵناو. ١. نخرۆ؛ بن ئاوکەوتوو ٢. قووتەڵە؛ ڕووتەڵە ☰ ١. زیرآب شده ٢. لُخت و بی‌نمود

**قوته‌ک** / qûtek/: ناو. قووچ؛ قووچەک؛ جۆرێک تەشکی هەندەسی وەک کەلە قەند ☰ مخروط

**قوته‌که** / qûteke/: ئاوەڵناو. قووتەکی؛ قووچ؛ بە شێوەی کەلە قەند ☰ مخروطی

**قوته‌کی** / qûtekî/: ☜ **قوته‌که**

**قوته‌ڵ** / qûteł/: ئاوەڵناو. ڕووت و پەتی؛ ڕووتی تەواو ☰ لُخت و برهنه

**قوته‌ڵه** / qûteła/: ☜ **قوته**[2]**ـ٢**

**قوتی** / qûtî/: ناو. ١. ڕووتی؛ زەلووتی؛ دۆخی ڕووت و پەتی بوون ٢. قوتوو؛ قودیک؛ قالک ☰ ١. برهنگی ٢. قوطی

**قوج**[1] / qûc/: ناو. ١. دۆخی بە سەر یەکدا هاتنی پەلکی چاو یان قامکی دەست ٢. دوند؛ قولە؛ لووتکەی کێو ☰ ١. حالت برهم آمدن پلک یا انگشتان ٢. قُلەی کوه

**قوج**[2]: ئاوەڵناو. بەرز و قوت و کەلەقەندی ☰ بلند و برجسته و مخروطی

**قوجان** / qûcan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //قووجای؛ دەقووجێی؛ بقووجێ// قووجیان؛ قووچان؛ قووجیای؛ وێکهاتنی پەلکی چاو یان قامکی دەست ☰ برهم آمدن پلک یا انگشتان

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: قووجاو/ چاوگی نەرێنی: نەقووجان

**قوجاندن** / qûcandin/: چاوگ. تێپەڕ. //قووجاندت؛ دەقووجێنی؛ بقووجێنە// قونجانن؛ قونجاندن؛ قووچاندن؛ قووچانن؛ قووجنای؛ چووقاندن: ١. بە سەر یەکا هێنانی پەلکی چاو یان قامکی دەست ‹چاوی قووجاند؛ مشتت بقووجنە› ٢. وێکهێنانی کونی قن ‹دوای ترِین قنگ قوّجاندن؟! «مەسەل»› ☰ ١. برهم آوردن پلک چشم یا انگشتان ٢. بستن سوراخ مقعد

**قوجانن** / qûcanin/: ☜ **قوجاندن**

**قوجنای** / qûcnay/: ☜ **قوجاندن**

**قوجیاگ** / qûcyag/: ☜ **قوچاو**

**قوجیان** / qûcyan/: ☜ **قوجان**

**قوجیای** / qûcyay/: ☜ **قوجان**

**قوچ**[1] / qûç/: ناو. قوویچ: ١. قووچەک؛ قووتەک؛ جۆرێک تەشکی هەندەسی وەک کەلە قەند ٢. نیشانەی کەوشەن ☰ ١. مخروط ٢. علامت مرز

**قوچ**[2]: ئاوەڵناو. قوویچ: ١. قووتەکە؛ بە شێوەی کەلە قەند ٢. بەرز؛ بلند؛ بلیند ☰ ١. مخروطی ٢. بُلند

**قوچان** / qûçan/: ☜ **قوجان**

**قوچاندن** / qûçandin/: ☜ **قوجاندن**

**قوچانن** / qûçanin/: ☜ **قوجاندن**

**قوچاو** / qûçaw/: ئاوەڵناو. قووجیاگ؛ بەسراو؛ بەسیاگ ☰ بسته

**قوچک** / qûçik/: ☜ **قوچه‌ك**

**قوچکه** / qûçke/: ناو. دووچک؛ ترۆپک ☰ اوج

**قوچه‌ک** / qûçek/: ناو. قووچک؛ قووچی چکۆلە ☰ مخروط کوچک

**قوچه‌که** / qûçeke/: ناو. قوویچک؛ سەرتلی؛ تلەک؛ کۆڤک؛ ئەنگوستیلەی دروومان ☰ انگشتانه

**قوچیان** / qûçyan/: چاوگ. نقیان؛ قووچان؛ قووژیان؛ چووقان ☰ برهم نهاده شدن

**قوخه‌ڵ** / qûxeł/: ناو. مەلێکە لە لەقلەق دەکا و گچکەترە، لە دەم ئاوان دەگەڕێ ☰ پرندەای است

**قور** / qûr/: ئاوەڵناو. قووڵ؛ کووڕ ☰ ژرف

⊡ **قور کرن** ڕاکشان لە سەر سنگ بۆ ئاو خواردنەوە لە کانی ☰ درازکشیدن برای نوشیدن

آب از چشمه

**قورانـدن / qûrandin**/: چـاوگ. ۱. بۆڕانـــدنی ڕەشەوڵاخ ۲. قوروسکاندنی سەگ لە کاتی ئازار پێگەیشـتندا 🇮🇷 ۱. مـاغ کشـیدن ۲. زوزه کشـیدن سگ

**قورک / qûrik**/: نـاو. پاش پانیـە؛ پشـت پاژنـە 🇮🇷 عقب پاشنه

**قورەت / qûret**/: ☜ **قووەت**

**قوری / qûrî**/: ☜ **قۆری ـ۱**

**قـوڕان / qûřan**/: چـاوگ. قوڕووسـکان؛ ناڵــین ‹سەد جار قووڕانم بە هەناسەی سارد/ بۆ شتێ هەرزن بۆ لەویچێ ئارد «قانع»› 🇮🇷 زوزه کشیدن

**قوڕاندن / qûřandin**/: ☜ **قۆڕاندن**

**قوڕانن / qûřanin**/: ☜ **قۆڕاندن**

**قوڕەقوڕ / qûřeqûř**/: دەنگەناو. زووڕەزووڕ؛ گریان و شیوەن بە دەنگی بەرز 🇮🇷 گریه با صدای بلند

**قوڕییەزەرد / qûřîyezerd**/: ☜ **قۆڕیانەزەردە**

**قوڕییەزەردە / qûřîyezerde**/: ☜ **قۆڕیانەزەردە**

**قوز / qûz**/: ناو. خەز؛ دەڵـەک؛ کـووژە؛ کـویژک؛ گیانــەوەرێکی ڕاوی گوهانـدار و گۆشـتخۆرە، لـە ڕێوی دەکا، بەڵام گچکەترە. پێسـتی پشـتی لـە هاویناندا قاوەیی و ژێر سکی سپییە و لە زسـتاندا تەواو سپی دەبێتەوە و تەنیا جووچکەی بە بـۆری دەمێنێتەوە، کە لەم کاتەدا «قاقم»ی پێ ئێژن 🇮🇷 خز

**قوزنای / qûznay**/: ☜ **قوروسکاندن**

**قـوزە / qûze**/: دەنگەناو. لـوورە؛ دەنگـی درێـژی گورگ و سەگ 🇮🇷 زوزه

**قـوزی / qûzî**/: ناو. بیاوان؛ ڕووتەن؛ چۆڵ و بیابـان 🇮🇷 صحرا

**قوزیای / qûzyay**/: ☜ **قوروسکان**

**قوزین / qûzîn**/: ئاوەڵناو. دروسـتکراو لـە پێسـتی دەڵەک 🇮🇷 پوستین از خز

**قـوژیان / qûjyan**/: چـاوگ. نقیـان؛ قووچـان؛ قووچیان؛ چووقان 🇮🇷 برهم نهاده شدن

**قوشچی / qûşçî**/: ناو. بازپەڕێن؛ بازەوان 🇮🇷 بازپران؛ قوشچی

**قوشکاغەز / qûşkağez**/: ناو. فڕۆکـەی کاغـەزی 🇮🇷 موشک کاغذی

**قوفک / qûfik**/: ناو. قەرتاڵەی میوە 🇮🇷 سبد میوه

**قوفلانـدن / qûf(i)landin**/: چاوگ. قرچ هەڵـێنان (چەرم) 🇮🇷 چروک برداشتن (چرم)

**قوفلین / qûf(i)lîn**/: چاوگ. قرچ هەڵاتن (چـەرم) 🇮🇷 چروک شدن (چرم)

**قوقان / qûqan**/: ☜ **قوقاندن**

**قوقاندن / qûqandin**/: چاوگ. تێنەپەڕ. //قووقاندت؛ دەقووقێنی؛ بقووقێنە// قووقانن؛ قووقان؛ قووقنـای؛ دەنگ هەڵبڕینی کەڵەشێر 🇮🇷 خواندن خروس

■ ئاوەڵــناوی بــەرکاری: ـــ/ چـاوگی نــەرێنی: نەقووقاندن

**قوقانن / qûqanin**/: ☜ **قوقاندن**

**قوقنای / qûqnay**/: ☜ **قوقاندن**

**قوقو / qûqû**/: دەنـگ. دەنگی هەندێ پەلەوەری وەک بایەقوش و کەڵەشێر و ... ‹مـن و بایـەقوش هەر قووقوومانە/ من لە چۆڵ ئەمخوەند ئەو لە وێرانـە «فولکلۆر»› 🇮🇷 کوکو؛ صدای برخی پرنده

**قول[1] / qûl**/: ناو. ۱. ☜ **قولە** ۲. کون؛ کونا 🇮🇷 ۱. ☜ **قولە** ۲. سوراخ

⊡ **قول کرن**: کون کردن 🇮🇷 سوراخ کردن

**قول[2]**: ☜ **قوڵ**

**قـولا / qûla**/: نـاو. هـەرا؛ قێـرە؛ دەنگـی بـەرز 🇮🇷 فریاد؛ بانگ

**قولاقـول / qûlaqûl**/: نـاو. هــەرا و هــاوار 🇮🇷 داد و فریاد

**قولان / qûlan**/: ☜ **قولاندن**

**قولانـدن / qûlandin**/: چاوگ. تێنەپەڕ. //قوولانـدت؛

دەقووڵێنی؛ بقووڵێنە// قووڵانن؛ قـووڵان؛ قووڵیـای؛ هەرا کردن بە دەنگی بەرز ⊑ فریاد زدن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەقووڵاندن

**قوولانن / qûlanin/**: ☜ **قوولاندن**

**قـوولت / qûlt/**: ئاوەڵناو. ١. بێناوەرۆک (هێلکـە) ٢. بێکاکڵ؛ هیچتێدا نەماو (میوە) ⊑ ١. توخالی (تخم مرغ) ٢. مغز درآمده (میوە)

**قـوولنای / qûlnay/**: چاوگ. هاوار کـردن ⊑ فریـاد کشیدن

**قوولون / qûlun/**: ناو. بەشێک لـە ڕیخۆڵـە گـەورە کە خۆی دەبێتە سێ بەشی: هەڵـچۆ، ئاسـۆیی و داچۆ ⊑ قولُن

**قووله / qûle/**: دەنگەناو. قووڵ؛ قوویلـە: ١. قێـڕە و هەرا ٢. کـاری بـە دەنگـی بـەرز دە گیانـەوەری دڕنـدە ڕاخـوڕین ٣. دەنگـی بایـەقوش ‹قووڵـەی بایەقوش سـوب وە هـەردەوە/ زام کۆنـە و نـۆم تـازە کەردەوە «مەولەوی»› ⊑ ١. فریاد؛ غریو ٢. نهیب بـر حیوان درندە ٣. صدای جُغد

⊡ **قووله به کـاریّ کـردن**: *[مـەجاز]* کارێـک زۆر بـە باشی و بێ کەموکـووڕی جێبـەجێ کـردن ⊑ کولاک کردن؛ کاری را فوق‌العادە خوب پیش بُردن

**قووله کردن**: ١. هەرا ـ هـەرا کـردن ٢. *[مەجاز]* کارێک بە باشی ئەنجام دان ⊑ ١. سروصـدا راە انداختن ٢. کاری را خوب انجام دادن

**قوولـەقـوول / qûleqûl/**: دەنگـەناو. قووڵـەی زۆر؛ هەرا۔ هەرای زۆر و لـە دوای یـەک ⊑ همهمـە و سروصدا

⊡ **قوولەقوول بون**: هەرا و زەنای زۆر داکەوتن؛ قاڵ و قوو بەرز بوونەوە ⊑ معرکە راە افتادن

**قوولیای / qûlyay/**: ☜ **قوولاندن**

**قووڵ / qûł/**: ئاوەڵناو. قووڵ؛ قوویل؛ قویل: ١. چاڵ؛ نووق؛ ساکۆڵ؛ سووتار؛ کاس؛ بـە بـنی خـوارتر و نزمتر لە دەور و بەری ٢. *[مەجاز]* هێدی؛ بەتاقەت؛ لەسـەرخۆ ٣. *[مـەجاز]* ورد؛ تیـژ؛ جێگـەی بـیر لێکردنەوەی زۆر ‹لێکۆڵینەوەی قووڵ› ⊑ ١. گـود ٢. شکیبا؛ خوددار ٣. دقیق

⊡ **قووڵ خوێندنەوە**: *[مەجاز]* باش تێفکرین؛ زۆر بـیر لێکردنەوە ⊑ اندیشیدن

**قووڵ کردنەوە**: ١. چاڵ کـردن؛ کەنـدن و نـووق کردن ٢. *[مەجاز]* زۆر بیر لێکردنەوە ⊑ ١. گـود کردن ٢. عمیق تفکر کردن

**چاو چونە قوڵا**: *[کینایە]* لەڕ و بێڕەنگ بوون ⊑ لاغر و تکیدە شدن

**قووڵایی / qûłayî/**: نـاو. قووڵـی؛ کـووری: ١. نـق؛ چاڵی؛ کوديله؛ بتەوی؛ دۆخ یان چۆنیـەتی قـووڵ بـوون ‹قووڵاییەکـەی باشـە› ٢. چـاڵ؛ قووڵـک؛ قووڵکە؛ قووڵ ‹قووڵایی چەنە› ⊑ ١. عُمق؛ ژرفـا ٢. گودی

**قووڵک / qûłik/**: ناو. ١. زەوی چاڵبوو ٢. چـاڵایی هەر شتێک ⊑ ١. چالە در زمین ٢. گودی

**قووڵکە / qûłke/**: ناو. چاڵایی زەمین ⊑ چالە

**قووڵکـە و تـەمبار / qûłke w tembar/**: نـاو. کەندولەند ⊑ چالەچولە

**قووڵەک / qûłek/**: نـاو. دەفری تایبەتی پووڵ تێـدا پاشەکەفت کردن ⊑ قُلَک

**قـووڵی / qûłî/**: نـاو. ١. قـــووڵایی؛ کـــووری ٢. قبووڵـی؛ قوبڵـی؛ شـێوی برنجـی نەپاڵـێوراو و گۆشت و ... ⊑ ١. ژرفا؛ عُمق ٢. دمپُختک

**قووڵینە / qûłîne/**: ناو. قوڵـینە؛ جـۆرێ قرتاڵـەی قووڵی لە تووڵ چنراو ⊑ نوعی سبد گود

**قـوم / qûm/**: ناو. ڕەڵم؛ ڕەمڵ؛ زیخـی زۆر ورد ⊑ ریگ؛ ماسە

**قومچک / qûmçik/**: ناو. ئەنگوستیلە ⊑ انگشتانە

**قومچە / qûmçe/**: ناو. خونچە؛ غونچە ⊑ غنچە

**قومـەڵان / qûmełan/**: نـاو. زیخـەڵان؛ جێگـای ڕەڵمی زۆر ⊑ ریگزار

**قوون / qûn/**: ناو. *[شووره‌یی]* قووین؛ قنگ؛ قینـگ: ١. لای پشـتـه‌وه‌ی هـه‌ر شـتێک ٢. بنـه‌وه؛ لای خوارو ٣. کونی ڕیانی گیاندار ٤. که‌فه‌ڵ؛ که‌ماخ؛ سوورین؛ زۆپی ژێر ناوقـه‌د و ژووری ڕان ‹چوومـه حه‌سار، پیرێژنێکی قوون قه‌ڵه‌وی تۆپه‌ڵ ڕابرد «هه‌ژار، چێشتی مجێور»› ٥. ده‌ور و پشت ‹جێگای مێردان قوون ته‌ندووره «مه‌سه‌ل»› ☰ ١. پُشت ٢. ته؛ عقـب ٣. مقعد ۴. باسن ۵. کنار

▣ **قوون خڕ کردن**: له سه‌ره‌ن دان؛ قونه‌که‌و کردنی ده‌غڵ ☰ با سرند بیختن

**قوون خڕ کردنه‌وه**: *[کینایه، پلار]* قه‌ڵه‌و بوونه‌وه لـه ته‌مبه‌ڵییان ☰ چاق شدن از فرط تنبلی

**قـوون خـۆی نـه‌خواردن**: *[مـه‌جاز]* هـه‌دا نـه‌دان و نه‌سره‌وتن ☰ آرام نگرفتن

**قوون دان**: *[شووره‌یی]* قنگ دان ☰ کون دادن

**قـوون دانه سه‌ر ده‌رپێی خۆ**: *[کینایه، پلار]* ڕاده‌ی خۆ زانین و داوا و ئاره‌زووی نه‌گونجاو نـه‌کردن ☰ پا از گلیم خود درازتر نکردن

**قوونار / qûnar/**: ناو. قوونێر: ١. لکه‌ڕه‌زێ کـه لـه کۆته‌ره ده‌رچووه و به‌ری نییه و زیانه بۆ به‌ری دار ٢. جۆرێ دمه‌ڵ کـه لـه ده‌وری قـوون دێـت ٣. *[کینایه]* چـه‌وره؛ پاشـاوخۆر؛ لامـژ؛ سـه‌ربار ☰ ١. پاجوش ٢. نوعی دُمل که بیشتر در اطراف مقعد پیـدا می‌شود ٣. انگل

▣ **قـوونار ده‌رکردن**: قـوونێر ده‌رکـردن: ١. قوونـار شین بوون له داری ڕه‌ز ٢. دومه‌ڵ له جێگـه‌ی خـراپ هـاتن ٣. دمه‌ڵـی قوونـار بـه نه‌شـته‌ر دڕاندن ☰ ١. پاجوش از تاک روییـدن ٢. دُمـل از جای ناجور درآمدن ٣. سـر دُمـل را بـا نیشـتر بـاز کردن

**قـوونار کـردن**: لکـی لاپره‌ســه‌ن لــه داره‌مێــو کردنه‌وه ☰ هرس کردن پاجوش

**قووناو / qûnaw/**: ناو. پاینا‌و؛ ئاوێ که له ئاوداشتنا له زه‌وی ده‌رده‌چێ ☰ پساب آبیاری

**قوون‌به‌گێچه‌ڵ / qûnbegêçeł/**: ☜ **قنگ‌به‌گێچه‌ڵ**

**قوون‌پاڵـه / qûnpałe/**: نـاو. ئـاخر کـه‌س لـه لای چه‌پ‌ه‌وه له به‌ره‌دروێنه‌دا ☰ نفر آخر در سمت چـپِ صف درو

**قـوون‌پان / qûnpan/**: ئاوه‌ڵنـاو. ١. *[کینایـه، پـلار]* زه‌لامـی ته‌مبـه‌ڵ ٢. *[پلار]* قنـگ‌زل؛ سمـت و که‌فه‌ڵ پان ☰ ١. لنـدهور تنـه‌لـش ٢. دارای باسـنِ بزرگ

**قوونتلور / qûnt(i)lûr/**: ☜ **قنگه‌وتلور**

**قوون‌ته‌نـدور / qûntendûr/**: نـاو. ١. ده‌وروبـه‌ری ته‌ندوور ٢. *[کینایه]* بێکاری و ته‌مه‌ڵی ☰ ١. اطراف تنور ٢. تنبلی و بیکارگی

**قوونچڕ / qûnçiř/**: ناو. گیایه‌که بـه عـه‌رزه‌وه پـان ده‌بێته‌وه ☰ گیاهی است

**قـوونچڕک / qûnç(i)řik/**: نـاو. ١. ☜ **قـورنج** ٢. سیخورمه؛ سوخورمه ☰ ١. ☜ **قورنج** ٢. سُقُلمه

**قوونخڕ[1] / qûnxiř/**: ☜ **قوونه‌که‌و**

▣ **قوونخڕ کردن**: له سه‌ره‌ن دان؛ قوونه‌که‌و کردنی ده‌غڵ ☰ با سرند بیختن

**قـوونخڕ[2]**: ئاوه‌ڵناو. قـوون‌تۆپـه‌ڵ؛ سمـت‌خـڕ ☰ باسن‌تُپُل

▣ **قوون خڕ کردن**: *[کینایه، پلار]* هیچ نـه‌کردن و لـه ته‌نبه‌ڵییان قه‌ڵه‌و بوونه‌وه ☰ از تنبلی چاق شدن

**قوون‌خوار / qûnx(i)war/**: ئاوه‌ڵناو. *[پلار]* هێت‌خوار؛ گێڕ؛ سمت‌خوار ☰ باسن کج

**قووندان / qûndan/**: نـاو. سمته‌جووڵه‌ی باڵـدار ☰ تُخمدان مرغ

**قوونده / qûnde/**: ☜ **قنگده‌ر**

**قوونده‌ر / qûnder/**: ☜ **قنگده‌ر**

**قــوون‌ده‌هۆڵ / qûndehoł/**: ئاوه‌ڵـنـاو. *[پـلار]* ١. سمـت‌زه‌لام؛ قنـگ‌زل ٢. *[کینایـه، پلار]* ته‌نبـه‌ڵ؛ ته‌وه‌زه‌ل ☰ ١. باسن‌گنده ٢. تنبل

**قوونڕەش / qûnřeş/**: ناو. جۆرێک مراوییە، لە سۆنە و بۆرە بچووکتر، بەڵام زۆرتر لەگەڵ ئەوان دەبینرێ، پاشەڵی ڕەش، دندووکی بۆر و لاقی مەیلەو زەردە ⇆ اُردک اردەای

**قوونسور / qûnsûr/**: ناو. سیرەونە؛ گیایەکە بۆ دۆکلیو دەبێ ⇆ گیاهی خوراکی

**قوونفرە / qûnf(i)re/**: ناوەڵناو. *[شوورەیی، پلار]* ١. ترسەنۆک؛ کەلەزات ٢. تەوەزەل؛ تەمبەڵ ⇆ ١. ترسو ٢. کون‌گشاد

**قوونقورس / qûnqurs/**: ☜ **قوونگران**

**قوونکشک / qûnkişk/**: ناو. کەسێ کە لە سەر قنگ دەخزێ ⇆ شخصی که بر باسن می‌خزد

**قوونکشکێ / qûnkişkê/**: ناو. گاولکە؛ گاولکێ؛ کاری گاگۆلە کردنی منداڵ ⇆ عمل لوکیدن بچه

**قوونگ / qûng/**: ناو. *[شوورەیی]* قنگ؛ قن؛ قوون؛ کونی پاشەوە ⇆ کون

**قوونگران / qûng(i)ran/**: ناوەڵناو. *[پلار]* قوونقورس؛ تەمبەڵ؛ تەوەزەل؛ تەپ ⇆ تنبل

**قوونگرانی / qûng(i)ranî/**: ناو. *[پلار]* لۆژە؛ تەمەڵی ⇆ تنبلی

**قوونلێکەوتوو / qûnlêkewtû/**: ☜ **قنگ‌لێ‌کەوتوو**

**قوونوو / qûnû/**: ناو. گۆزەی هەنگ کە بە قوڕ چەن گۆزەی‌تری پێوە دەلکێنن ⇆ کوزەی کندو برای زنبور عسل

**قوونە ــ / -qûne/**: پێشوشە. ١. لای پشتەوە ‹قوونەبان؛ قوونەدەوەڵان› ٢. نیوە و ناتەواو؛ نیمەچڵ ‹قوونەشەڕ› ⇆ ١. پُشت ـ ٢. نیمه ـ

**قوونەبان / qûneban/**: ناو. ١. قنگەبان؛ لای پشتەوەی بانی خانوو ‹لە ڕێگە تووشی تاقە ماڵەیەک هاتین لە زار گەڵی کە ڕێگە و قوونەبانی ماڵەکە یەک بوون «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. *[کینایە]* ئاشنایەتی؛ ناسیاوی؛ چۆنییەتی ئاشنا بوون ٣. *[کینایە]* تاقەت و حەوسەڵەی کار کردن ⇆ ١. قسمت عقبی بام ٢. رابطه و آشنایی ٣. حوصله و عُرضه‌ی کار کردن

**قوونەجند / qûnecind/**: ☜ **قنگەجنۆکە**

**قوونەجوڕە / qûnecûře/**: ناو. ئەندامێکی مریشک و پەلەوەرە، بریتی لە سەر پشتی بە هەر دوولادا، کە لکاوەتە سەر قوونیەوە ⇆ از اندام‌های داخلی مرغ

⊡ **قوونەجوڕە کردن**: *[کینایە]* خۆ پاراستن؛ مل نەدان؛ دوور گرتن ‹هەرچی قوونەجووڕەم کرد، کێشامیە دوکان و لە سەر یەک دەیگوت: تۆ مایەی شانازی کوردانی! «هەژار، چێشتی مجێور»› ⇆ پرهیز کردن

**قوونەخشکە / qûnexişke/**: ناو. قوونەخشکێ؛ بە باری ڕۆنیشتنەوە خۆ کشان بەرەو جێگایەک ‹وردە ـ وردە بە قوونەخشکە خۆم بەرەو زێ خزاند «هەژار، چێشتی مجێور»› ⇆ کونخیزه

**قوونەخشکێ / qûnexişkê/**: ☜ **قوونەخشکە**

**قوونەخەو / qûnexew/**: ☜ **قنگەخەو**

**قوونەزێ / qûnezê/**: ناو. کەرکە مەڕێ کە هەمووی بەر و بووی یەکتر بێ ⇆ گلەای که گوسفندانش همه از یک ریشه باشند

**قوونەقوون / qûneqûn/**: ناو. *[پلار]* لەشگرانی و تەمەڵی ‹قوونەقوون مەکەن! کارەکە زۆری نەماوە› ⇆ شُل‌بازی

**قوونەکەو / qûnekew/**: ناو. قنگەکەو؛ قوونخڕ؛ کاری دەغڵ بە سەرەن کردن بە ڕۆنیشتنەوە ⇆ غربال غله در حالت نشستن

⊡ **قوونەکەو کردن**: *[کینایە]* گەڕان و ئەزموون وەرگرتن ‹دنیام قوونەکەو کردووە› ⇆ گشتن و تجربه آموختن

**قوونەگاز / qûnegaz/**: ☜ **قنگەگاز**

**قوونەگان / qûnegan/**: ☜ **قنگەگان**

**قوونەڵتس / qûneltis/**: ☜ **قنگەڵتس**

**قوونەڵفس** / qûnełfis/: ☜ **قنگەڵس**

**قوونەنشینە** / qûnen(i)şîne/: ناو. قنگەنشین؛ قنگەنشینە؛ قنگەنشینکە؛ ڕموتی فێرە دانیشتن بوونی زارۆ ‹مندالەکەم قوونەنشینە بووە› 🇮🇷 عمل نشستن آموختن کودکان

**قوونەوتلور** / qûne w t(i)lûr/: ☜ **قنگەوتلور**

**قوونهەڵتەکێنە** / qûnhełtekêne/: ☜ **قنگهەڵتەکێنە**

**قوونهەڵدراو** / qûnhełd(i)raw/: ئاوەڵناو. [پەلار] خوێڕی؛ شەلاتی؛ هیچوپووچ 🇮🇷 بی‌سروپا

**قوونهەڵکرێنە** / qûnhełk(i)řêne/: ناو. ڕەشەمە؛ دوایین مانگی سالی کوردی 🇮🇷 اسفند

**قوونێر** / qûnêr/: ☜ **قونار**

**قووە** / qûwe/: ناو. ١. باتری؛ پیل ٢. ☜ **قووەت** 🇮🇷 ١. باطری ٢. ☜ **قووەت**

**قووەت** / qûwet/: ناو. قوورەت؛ قووە؛ تاقەت؛ توان؛ هێز؛ وزە 🇮🇷 نیرو؛ قوّت

**قوویاک** / qûyak/: ☜ **قالاو**

**قوویت** / qûyt/: ☜ **قوت**

**قوویچ** / qûyç/: ☜ **قووچ**

**قوویچک**[1] / qûyçik/: ناو. ١. سەرتلی؛ تلەک؛ کۆڤک ٢. ☜ **قوچەکە** 🇮🇷 ١. انگشتانە ٢. ☜ **قوچەکە**

**قوویچک**[2]: ئاوەڵناو. قووچ؛ کەللەقەندی 🇮🇷 مخروطی

**قوویل** / qûyl/: ☜ **قوڵ**

**قوویلە** / qûyle/: ☜ **قولە**

**قووین** / qûyn/: ☜ **قون**

**قووینده** / qûynde/: ☜ **قنگەمر**

**قە** / qe/: ☜ **قەت**[2]

**قەب** / qeb/: ☜ **قەبۆ**

**قەبا** / qeba/: ☜ **قەبە**

**قەباحەت** / qebahet/: ناو. ناحەزی؛ دزێوی ‹کام قەباحەتم لە دەس قەوماوە؟/ بۆچی ناو چاوم لای تۆ نەماوە؟ «قانع»› 🇮🇷 قباحت

☐ **قەباحەت بوون** دزێو بوون؛ ناحەز بوون 🇮🇷 قباحت داشتن

**قەباخ** / qebax/: ناو. ١. ☜ **قاپاخ** ٢. قەباغ؛ کدوو؛ کوندر؛ کوولەکە ٣. قابلۆخ؛ قەوان؛ قاپۆر؛ پووکە؛ قەباخە؛ جێی باڕووتی فیشەک ٤. نووشتەی چاوزاری بێستان ٥. جۆرێ سپیدار 🇮🇷 ١. ☜ **قاپاخ** ٢. کدو ٣. پوکە ٤. دعای رفع چشم‌زخم جالیز ٥. نوعی سپیدار

**قەباخە** / qebaxe/: ☜ **قەباخ ـ٣**

**قەبارە** / qebare/: ناو. ١. بارست؛ بارستایی ٢. ☜ **قەباڵە** 🇮🇷 ١. حجم ٢. ☜ **قەباڵە**

**قەباغ** / qebağ/: ☜ **قەباخ ـ٢**

**قەبال** / qebal/: ئاوەڵناو. ١. دەستەبەر؛ ئەستۆگر؛ بەڵێندار ٢. سووتخۆر؛ سووخۆر 🇮🇷 ١. مُتعهد ٢. رباخوار

**قەباڵە** / qebałe/: ناو. قەواڵە؛ قەبارە؛ تاپۆی مڵک 🇮🇷 سند مالکیت

**قەبانجەرە** / qebancere/: ☜ **قەپانجەرە**

**قەبایی** / qebayî/: ☜ **قەبەیی**

**قەبدە** / qebde/: ناو. قەبزە؛ قەفد؛ قەفت: ١. دەسکی دەمانچە، شمشیر و خەنجەر ٢. یەکەی ژماردنی چەکی دەستی (وەک شمشێر، دەمانچە و...) 🇮🇷 ١. قبضە؛ دستەی تپانچە، شمشیر و خنجر ٢. قبضە

**قەبر** / qeb(i)r/: ناو. قەور؛ قەبرە؛ گۆڕ؛ دەخمە؛ گلکۆ؛ گۆڕن؛ گمەر؛ ترب؛ ترپ؛ تا؛ تەو؛ چالی مردوو تێدا ناشتن 🇮🇷 قبر؛ گور

☐ **قەبر هەڵکەندن/ هەڵقەندن** ١. هەڵکەندنی گۆڕ لە زەوی ٢. هەڵدانەوەی خاکی مردوو ‹لە ڕقا چووبوون قەبرەکەیان هەڵکەندبوو› 🇮🇷 ١. گور کندن ٢. نبش قبر کردن

**قەبران** / qebran/: ناو. قەبرسان؛ قەبرستان؛

قەوران؛ قەورسان؛ گۆڕستان؛ زیارەتان؛ شاری خامۆشان؛ مەڵبەندی کفن‌پۆشان 🇮🇷 گورستان

**قەبراوقەبر** / qebrawqebr/: ↓

◻ **قەبراوقەبر کردن**: ١. لە کۆنەقەبردا ناشتنی مردوو ٢. [باوەڕی کۆن] گواستنەوەی لاشی مردووی خراپ لە گۆڕستانی موسڵمانان بۆ گۆڕستانی کافران، لە لایەن فریشتەوە 🇮🇷 ١. مرده را در گور کهنه دفن کردن ٢. منتقل کردن جسد کافر از گورستان مسلمانان به گورستان کافران، توسط فرشتگان

**قەبرخە** / qeb(i)rxe/: ناو. قەبرغە؛ قەپرخە؛ قەورخە: ١. برک؛ خالیگە؛ کەلەکە ٢. پاڵ؛ لاپاڵ؛ پەنا 🇮🇷 ١. تُهیگاه ٢. بغل؛ کناره

**قەبرسان** / qeb(i)rsan/: ☜ **قەبران**

**قەبرستان** / qebristan/: ☜ **قەبران**

**قەبرغە** / qebirğe/: ☜ **قەبرخە**

**قەبرە** / qebre/: ☜ **قەبر**

**قەبرەڵقەن** / qebrełqen/: ☜ **قەبرهەڵکەن**

**قەبرهەڵقەن** / qeb(i)rhełqen/: ☜ **قەبرهەڵکەن**

**قەبرهەڵکەن** / qeb(i)rhełken/: ناو. قەبرەڵقەن؛ قەبرهەڵقەن؛ قەورکەن؛ گۆڕکەن؛ ئەوەی گۆڕ بۆ مردوو هەڵدەقەنێ ‹چییە سووچ و گوناهی بۆچی دەیکاتە جەزاخانە/ لە قەبرهەڵکەن هەتا ڕۆژی جەزا دەعواچییە قەبرم «مەحوی»› 🇮🇷 آدم گورکن

**قەبز**[1] / qebz/: ناو. ١. دۆخی زگ وێستان؛ دژی ڕەوانی ٢. پسوولە؛ ڕەسید ‹قەبزی ئاو› 🇮🇷 ١. یبوست ٢. رسید

◻ **قەبزی پاییز**: ناوەڕاستەکانی کژی پاییز 🇮🇷 اواسط پاییز

**قەبز**[2]: ئاوەڵناو. ١. بەسراو؛ زگ‌وێستاو ‹سەوزە بخۆ تا قەبز نەبی› ٢. جاڕز؛ عاجز؛ وەڕەز 🇮🇷 ١. یُبس ٢. پکر

**قەبزە** / qebze/: ناو. ١. بەرگە نووشتە؛ بەرگی دوعای نووسراو ٢. قۆزە؛ قەوزە ٣. جەنگە؛ هەڕەت ٤. ☜ **قەبدە** 🇮🇷 ١. پوشش دعای نوشته ٢. خزه ٣. عنفوان ۴. ☜ **قەبدە**

**قەبزی** / qebzî/: ناو. ١. ڕەوتی زگ وێستان ٢. وەڕەزی؛ عاجزی؛ دڵتەنگی 🇮🇷 ١. یبوست ٢. دلتنگی

**قەبقەبۆک** / qebqebok/: ناو. ڕێزەڵە؛ شیرین‌وتاڵ؛ تەماتەمرۆژە 🇮🇷 تاجریزی

**قەبڵ** / qebł/: ناو. ١. خەمڵ؛ ڕەوتی قرسان ٢. ڕەوتی گەشە کردن و پێگەیشتنی خەڵە 🇮🇷 ١. ارزیابی ٢. بالندگی و رسیدن کشت

**قەبڵان** / qebłan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //قەبلای؛ دەقەبلێی؛ بقەبلێ// قەبلین؛ قەولان: ١. نرخان؛ خەملان؛ نرخ لە سەر دانران ٢. پێگەیشتنی خەڵە 🇮🇷 ١. ارزیابی شدن؛ برآورد شدن ٢. رسیدن غله

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: قەبلاو/ چاوگی نەرێنی: نەقەبلان

**قەبڵاندن** / qebłandin/: چاوگ. تێپەڕ. //قەبلاندت؛ دەقەبلێنی؛ بقەبلێنە// قەولاندن؛ قەولانن؛ قەبەڵنای؛ قرساندن؛ نرخاندن؛ خەملاندن 🇮🇷 ارزیابی کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ــــ/ چاوگی نەرێنی: نەقەبلاندن

**قەبڵاو** / qebław/: ئاوەڵناو. خەمڵ کراو؛ قرساو؛ بەراوردکراو 🇮🇷 ارزیابی‌شده

**قەبڵین** / qebłîn/: ☜ **قەبڵان**

**قەبۆ** / qebo/: ناو. قەب؛ ڕکابەر؛ حەریف لە مەیدانی شەڕدا 🇮🇷 حریف

**قەبۆز** / qeboz/: ☜ **قەپۆز-٢**

**قەبۆ . قەبۆ** / qebo qebo/: دەنگ. وشەیەکە بۆ حەریف داوا کردن لە مەیداندا 🇮🇷 اصطلاحی برای مُبارز طلبیدن

**قەبوو** / qebû/: ناو. ١. قاسپە؛ چریکەی کەو ٢.

حەشارگەی کەو ☰ ١. آواز کبک ٢. کمینگاه کبک

**قەبوڵ**[١] / qebûł/: ناو. قبووڵ؛ قوبـووڵ؛ قـەبوویل؛ قەبیل؛ قەویل؛ کار و ڕەوتی وەرگرتن؛ هەڵـگرتن؛ گلدانەوە ‹برا گیـان وا بکـە ڕۆژێ دوو نـانی وشـکم بداتێ، قەبووڵمە «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ قبول

⊡ **قەبـوڵ بـون:** دەرچوون؛ دەرهاتن؛ سـەرکەوتن ‹لە تاقی کردنەوەدا قەبووڵ بووم› ☰ قبول شدن

**قەبـوڵ کـردن:** وەرگــرتن ‹قســەکانمی قــەبووڵ کرد›. هەروەها: **قەبووڵ کران** ☰ پذیرفتن

**قەبوڵ**[٢]: ئاوەڵناو. قبووڵ؛ قوبووڵ؛ قەبوویل؛ قەویل؛ وەرگیراو؛ پەژێراو ‹بردمە مەدرەسە. ئەزموویان، لـە کلاسـی سـێهەمی سـەرەتایی قـەبووڵ کـرا «هـەژار، چێشتی مجێور»› ☰ پذیرفته

⊡ **قەبـوڵ بـون:** وەرگــیران؛ پــەژێران هــەروەها: **قەبووڵ کردن؛ قەبووڵ کران** ☰ پذیرفته شدن

**قەبوڵانـــدن** / qebûłandin/: چـــاوگ. تێـــەڕ. //قەبووڵاندت؛ دەقەبووڵێنی؛ بقەبووڵـێنە// قبلانـدن؛ قەبیلاندن؛ سەلماندن؛ بە زۆر پێ قەبووڵ کـردن ☰ قبولاندن

■ ئاوەڵـــناوی بـــەرکاری: ـــــ/ چـــاوگی نـــەرێنی: نەقەبووڵاندن

**قەبـوڵیان** / qebûłyan/: نـــاو. بەرگەدەمانچـــە؛ قۆڵاخی زۆرتر لە چەرم بۆ دەمانچە ☰ جلد تپانچه

**قەبویل** / qebûyl/: ☜ **قەبوڵ**

**قەبە** / qebe/: ئاوەڵناو. قەبا: ١. قەوی؛ ئەستوور ٢. *[پلار]* تەژە؛ زەلامی ناقۆلا ☰ ١. کُلُفت ٢. لندهور

**قەبـەدای** / qebeday/: ئاوەڵـناو. *[پـلار]* مـلقـەوی؛ گیزمل؛ ملهوڕ ☰ گردن‌کلفت

**قەبەزە** / qebeze/: نـاو. ئێسکی تـەختی سـنگ و پشت ☰ استخوان قفسه‌ی سینه

**قەبـەس** / qebes/: ناو. کوێزر؛ درشتەی لە گێـرەدا نەهاڕدراو ☰ کوزر

**قەبـەغاز** / qebeğaz/: ناو. خاسەسی؛ شاقاز ☰ غاز خاکستری

**قەبـەڵ** / qebeł/: نـاو. ١. قـەواڵ؛ مەختـە؛ کـاری لەبڕ؛ قۆنتەرات؛ کاری بە مزی یەکجاری (زۆرتر بۆ کشت‌وکاڵ) ‹دروێنەکەم بە قەبـەڵ داوە› ٢. قـەبڵ؛ ڕەوتی نرخانـدن ☰ ١. کُنتـرات (بیشـتر بـرای کـار کشاورزی) ٢. ارزیابی

**قەبـەڵنـای** / qebełnay/: چـاوگ. قەبلانـــدن ☰ ارزیابی کردن

**قەبـەیـی** / qebeyî/: نـاو. قـەبایی؛ ئەسـتووری ☰ ضخامت

**قەبیل** / qebîl/: ☜ **قەبوڵ**

**قەبیلاندن** / qebîlandin/: ☜ **قەبوڵاندن**

**قەبیلە** / qebîle/: ناو. قەویلە؛ خێڵ؛ تیرە ☰ قبیله

**قەپ**[١] / qep/: نـاو. ١. گـاز؛ کـاری هـەر دوو ڕیـزە ددان لێ گیر دان ٢. چنگی نیوەئاواڵە ٣. کـاری ڕفان ٤. پڕ بە دەستێک ☰ ١. گاز با دندان ٢. مشت نیمه‌باز ٣. رُبایش ۴. پُر یک کف دست

⊡ **قەپ داگرتن:** ١. قەپ گـرتن؛ پـڕ بـە دەم گـاز گرتن لە شتێ ٢. *[کنایە]* تـەماح کـردن ☰ ١. (چیزی را) گاز گرفتن ٢. طمع ورزیدن

**قەپ کردنە کەسێک/ شتێکدا:** قـەپ لـە کەسـێ/ شتێ گرتن ☰ کسی/ چیزی را گاز زدن

**قەپ گرتن:** گاز گرتن ☰ گاز گرفتن

**قـەپ**[٢]: ئاوەڵناو. ١. کپ؛ بێدەنگ ٢. زەبەلاح؛ زل و ئەستوور ☰ ١. بی‌صدا ٢. گُنده

**قەپات** / qepat/: ئاوەڵناو. داخراو؛ بەسیاگ ‹ڕاستە دەوێ هەرکەس، هەر تیرە، هـەر کۆمـەڵ، ئاوهـا بـێ چەقە و بێ گێچەڵ، وەکوو کیسـەڵ، لـە نـاو قـاپێکی قەپاتدا بۆ خۆی بژی و بیر و مـژی ... «هـەژار، *چـوار نامیلکە*»› ☰ بسته

**قەپات کردن:** داخستن؛ بەستن ☰ بستن

**قەپاتمە** / qepatme/: ناو. سوتلی؛ ژنی بێ‌مارەیی ڕاگرتن بۆ دەگەڵ ڕابواردن ☰ مترس؛ نگهداری زن

بدون نکاح برای خوشگذرانی

**قەپاخ / qepax/:** ☜ **قاپاخ**

**قەپاغ / qepağ/:** ☜ **قاپاخ**

**قەپال / qepal/:** ناو. کۆنەی شڕی بە بزگوڕ ⧉ لباس کُهنه و پینه خورده

**قەپاڵ / qepał/:** ناو. کاری پچڕینی پڕ بە دەم ‹گورگی بێدادی لە گیانم بەر بوو/ ئێشی جێ گاز و قەپاڵم تا کەی «هێمن»› ⧉ گاز کامل

▣ **قەپاڵ گرتن:** گاز (لێ)گرتن بە هەموو ددانان ⧉ گاز کامل گرفتن

**قەپاڵ لێ دان:** گاز (لێ) گرتن ⧉ گاز گرفتن

**قەپاڵگر / qepałgir/:** ناو. خێپک؛ ڕەمڵگرەوە؛ فالگرەوە ⧉ فال‌بین

**قەپاڵە / qepałe/:** ناو. بابۆڵە؛ ساندویچ؛ بالۆڵە؛ نەواڵە ⧉ ساندویچ

**قەپان[1] / qepan/:** چاوگ. قەپین؛ ڕفان ⧉ ربودن؛ قاپیدن

**قەپان[2]:** ناو. ١. قاپان؛ تەرازووی زل ٢. کۆڵەکەی تاقی ڕووکاری خانوو ⧉ ١. باسکول ٢. ستون طاق نمای ساختمان

▣ **قەپان کردن/ کرن:** لە قەپان دان؛ بە قەپان سەنگاندن ⧉ با قپان وزن کردن

**قەپانجەرە / qepancere/:** ناو. قەبانجەرە؛ قەفانجەرە: ١. ڕفێدە؛ مایە؛ دۆشەکۆڵەی نان کردن ٢. بنەگۆزەی لە شووڵ چندراو ٣. دۆشەکۆڵەی سەری حەمالان ⧉ ١. بالشتک نانوایی ٢. چمبرک ترکه‌ای ٣. بالشتک سر حمالان

**قەپانچە / qepançe/:** ☜ **قەڵماسک**

**قەپانچی[1] / qepançî/:** ناو. قەپاندار؛ خاوەن قەپان؛ کەسێ کە شت لە قەپان ئەدا ⧉ قپاندار

**قەپانچی[2]:** ئاوەڵناو. *[کینایە]* هووشەباز؛ درۆزنی زل ⧉ چاخان

**قەپاندار / qepandar/:** ☜ **قەپانچی[1]**

**قەپاندن / qepandin/:** چاوگ. تێپەر. //قەپاندت؛ دەقەپێنی؛ بقەپێنە// قەپانن: ١. ڕفاندن ٢. قووت دان ⧉ ١. ربودن ٢. بلعیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەقەپاندن

**قەپانن / qepanin/:** ☜ **قەپاندن**

**قەپانی / qepanî/:** ناو. مزی لە قەپان دان ⧉ مُزد قپانی

**قەپچاندن / qepçandin/:** چاوگ. هەوڵ و تەقالا دان ⧉ کوشش کردن

**قەپرخە / qep(i)rxe/:** ☜ **قەبرخە**

**قەپک / qepik/:** ئاوەڵناو. کرک؛ کرژ؛ کرە ⧉ کُرچ

**قەپڵاخ / qepłax/:** ناو. کلاوی لە پێست ⧉ کُلاه پوستین

**قەپوقڕ / qep û qiř/:** ☜ **قڕوقپ**

**قەپول / qepul/:** ناو. پاچەقولێ؛ کاری پا لە پا پێچان لە زۆرەوانیدا ⧉ لِنگ در کشتی

**قەپولکە / qepulke/:** ناو. تاسمە؛ قاشە کاڵەک و کوولەکەی وشکەوەکراو ⧉ برگەی پالیزی خشکیده

**قەپویچک / qepwîçik/:** ناو. تێکولی بەتاڵی میوە ⧉ پوستەی خالی میوه

**قەپۆ / qepo/:** ئاوەڵناو. ڕفێن؛ برفێن ⧉ رُباینده

**قەپۆچکە / qepoçke/:** ناو. قەپووشک؛ کەسپک؛ شەیتانۆکە ⧉ حلزون

**قەپۆز / qepoz/:** ناو. ١. بێقل؛ دم ٢. قەبۆز؛ لمۆز؛ لمبۆز؛ پۆز؛ دەم و کەپۆی حەیوان ⧉ ١. بینی ٢. پوزه

**قەپۆزبەران / qepozberan/:** ئاوەڵناو. پووزبەران؛ ئێسکی سەر لووتی زەق ⧉ دماغ عقابی

**قەپۆشکە / qepoşke/:** ناو. شەیتانۆکە؛ قەپووشک؛ کەسپک ⧉ حلزون

**قەپۆل / qepol/:** ئاوەڵناو. *[پلار]* قەپۆڵە؛ زلحۆل؛ زلی گەوج ⧉ گُندەی ابله

**قەپۆڵە / qepole/:** ☜ **قەپۆل**

**قەپوو / qepû/**: ناو. ١. پووکاولە؛ چەمۆلە؛ قژانک ٢. قاپۆر؛ پووکە؛ جێ باررووتی فیشەک ⊆ ١. ام ٢. پوکە

**قەپووچک / qepûçik/**: ناو. قەپووچکە: ١. قەپووشک؛ گەڵای وەک پەنجە کە پەڕەکانی گوڵی لە سەرە ٢. قاپووچکە؛ پارووی وەک بێلچە بۆ لە ماست دان ⊆ ١. کاسبرگ ٢. تکە نان بیلچە مانند برای ماست برداشتن

**قەپووچکە / qepûçke/**: ناو. ١. ☜ قەپووچک ٢. بۆفرە؛ تەقلە؛ بلقی سەر تراو ⊆ ١. ☜ قەپووچک ٢. حُباب روی مایع

**قەپووشک / qepûş(i)k/**: ناو. ١. قەپۆشکە؛ کەسپک؛ شەیتانۆکە ٢. ☜ قەپووچک ـ١ ⊆ ١. حلزون ٢. ☜ قەپووچک ـ١

**قەپووک / qepûk/**: ناو. قرپۆک؛ مێوژی وشکهەڵاتوو ⊆ مویز خشکیده

**قەپوولە / qepûle/**: ناو. قەپوولیلە؛ قەپوویلەی؛ پێوانە چکۆلەی دارینی ئاشەوان ⊆ پیمانەی کوچک چوبین آسیابان

**قەپوولیلە / qepûlîle/**: ☜ قەپوولە

**قەپوویلەی / qepûyley/**: ☜ قەپوولە

**قەپە / qepe/**: ناوەڵناو. *[پلار]* قەپ؛ زل و ئەستوور ⊆ گندە و ستبر

**قەپەک / qepek/**: ناو. پێڵوو؛ پیلوو؛ پیلۆ ⊆ پلک چشم

**قەپەگۆڵ / qepegoł/**: ناو. ١. گەماڵ؛ سەگی زلی نێر ٢. *[پلار]* مرۆی زلی زۆربێژ ⊆ ١. سگ نر بزرگ ٢. آدم گندەی زورگو

**قەپەلک / qepelik/**: ناو. قەپێلک؛ پیلۆ؛ پێڵوو؛ پەلکی چاو ⊆ پلک چشم

**قەپەنگ / qepeng/**: ناو. ١. قولاپی گۆشت هەڵواسین ٢. دەڕابە؛ کرکرە؛ چەشنێ دەرگا کە هەڵدەدرێتەوە ⊆ ١. چنگک ٢. کرکرە

**قەپیچک / qepîçik/**: ناو. تێخولی هەرەناسکی سەرەوە ⊆ قشر بسیار نازک سطحی

**قەپین / qepîn/**: ☜ قەپان[1]

**قەپێلک / qepêlik/**: ناو. ١. تێکول؛ تێخول؛ تۆکڵ؛ پەلک ٢. ☜ قەپەلک ⊆ ١. قشر؛ پوستە ٢. ☜ قەپەلک

**قەت[1] / qet/**: ناو. ١. ڕەوتی بڕیان ٢. بەش؛ پار؛ پشک ⊆ ١. قطع ٢. سهم؛ قسمت

▣ **قەت کردن**: بڕین؛ قرتاندن ⊆ قطع کردن

**قەت[2]**: ناوەڵکار. قە؛ چجار؛ هەرگیز؛ هیچگا ‹بەکەس نابێ بتی من ئاشنا قەت/ غەزاڵەی بەڕ نییە ڕامی وەفا قەت «مەحوی»› ⊆ هرگز

**قەتا / qeta/**: ناو. ١. قەتێ؛ ڕیخەخۆرە؛ کوڕکوڕ ٢. ڕیپۆق؛ گوژاو؛ پێخ؛ تراوی خەست و زەردی سیلەی چاو ٣. کاری خاوێن کردنەوەی دانەوێڵە ⊆ ١. سنگخوارە ٢. ژفک؛ قی چشم ٣. بوجاری

**قەتاب / qetab/**: ناو. دەمەزەرد؛ سەرنیا ⊆ ترمیم گاوآهن

**قەتار / qetar/**: ناو. ١. ڕیز؛ ڕزن؛ سەف ٢. کۆمەڵی چارەوێ بۆ بار کردن ‹قەتارێ پێشەنگی کەر بێ، بە تۆپینێ دەچێ «مەسەل»› ٣. هەوای گۆرانییەکە ٤. شەمەندەفەر ٥. ڕێزەدێراوێک بە شوێن یەکەوە ٦. فیشەکلۆخ؛ جێگەی فیشەک ⊆ ١. صف؛ ردیف ٢. قطار ستور ٣. آهنگی در موسیقی کردی ۴. قطار ۵. ردیفی از جوی آبیاری ۶ کمربند جای فشنگ

▣ **قەتار بەستن**: قەتارە بەستن: ١. ڕیز بەستن ٢. ڕێچکە بەستن؛ بە شوێن یەکا بە تەکووزی ڕۆیشتن ⊆ ١. صف کشیدن ٢. در پی هم با نظم رفتن

**قەتار پێکان**: بە شوێن یەکا بە تەکووزی ڕاوەستان ‹دەسنوێژ بشۆرن، نیەت دابەستن/ قەتار بپێکن، هەموو ڕاوەستن «قانع»› ⊆ به ردیف

شدن

**قەتار کردن:** قەتارە کردن؛ ڕیز کردن بە شوێن یەکا 🇮🇷 ردیف کردن؛ بە صف کردن

**قەتارچی / qetarçî/:** ناو. چارواداڕ؛ چەروەدار؛ وڵاخدار؛ کەسێ کە بارەبەر بە کرێ دەدا 🇮🇷 کسی کە چهارپایان را کرایە می‌دهد

**قەتارقولینگ / qetarqulîng/:** ☜ قازیقولنگ

**قەتارە / qetare/:** ناو. ۱. ڕیز؛ سەف ‹قاز و قورینگان دێن بە قەتارە/ مزگێنی دێنن فەسڵی بەهارە «حەقیقی»› ۲. زەنبەرێکی سەری ژنانە 🇮🇷 ۱. ردیف ۲. از زیورآلات زنانە

◘ **قەتارە بەستن:** ☜ **قەتار بەستن**

**قەتارە دان:** قەتار بەستن؛ ڕێچکە بەستن ‹هەر کە لەو ڕانە، بدا قەتارە/ مەر بێرگەی بگرێ ئەو شەدەلارە «فولکلۆر»› 🇮🇷 در پی هم با نظم رفتن

**قەتارە کردن:** ☜ **قەتار کردن**

**قەتان / qetan/:** چاوگ. قەتین: ۱. دوایی هاتن؛ تەواو بوون ۲. پسان؛ قرتیان؛ بڕیان 🇮🇷 ۱. تمام شدن ۲. قطع شدن

**قەتاندن / qetandin/:** چاوگ. ۱. تەواو کردنی کار ۲. ☜ **قرتاندن** ۳. بەش/ دابەش کردن 🇮🇷 ۱. انجام دادن ۲. ☜ **قرتاندن** ۳. تقسیم کردن

**قەتای / qetay/:** ئاوەڵناو. پچڕاو؛ پساو؛ قرتاو 🇮🇷 پارە؛ گُسستە

**قەتران / qetran/:** ناو. ۱. تراوێکی لینجی قاوەیی تا ڕەش، بریتی لە تێکەڵاوی چەند ماکی هیدرۆکەربونی چەور کە لە ئەنجامی دڵۆپاندنی بەردەخەڵووز و چێو بەرهەم دێ و بە کوڵاندنی، گەلێ ماکی بەکەڵک وەک نەوت جوێ دەبێتەوە ۲. دەرمانێکی ڕەشە لە کوڵاندنی داری سنەوبەر بەرهەم دێ 🇮🇷 ۱و۲. قطران

**قەترانی / qetranî/:** ئاوەڵناو. تۆخی بریقەدار ‹ڕەشی قەترانی› 🇮🇷 تیرەی براق

**قەترمە[1] / qetirme/:** ناو. بەلا و بەسەرهاتی ناخۆش 🇮🇷 بلا و مصیبت

**قەترمە[2]:** ئاوەڵناو. خرابە؛ وێران؛ خاپوور 🇮🇷 ویران

**قەترە / qetre/:** ناو. ۱. دڵۆپ؛ تنۆک ۲. قۆرتە؛ گورگەلۆقە؛ نیوە غار 🇮🇷 ۱. قطرە ۲. هروڵە؛ نیمەدو

**قەترەچەقان / qetreçeqan/:** ناو. ئاودوزەک 🇮🇷 قطرەچکان

**قەترەسەیە / qetreseye/:** ناو. ڕەفت؛ نیمەغاری لەگورگەلۆقە سەبرتر 🇮🇷 نوعی راه رفتن سریع

**قەترەکێش / qetrekêş/:** ناو. قەتارە؛ ئاودزەک؛ ئامرازێ بۆ تکاندنی دەرمان 🇮🇷 قطرەچکان

**قەترەمە / qetreme/:** ناو. کارەسات؛ کارەڕەهات؛ چۆرتم؛ کەت 🇮🇷 فاجعە؛ رویداد ناگوار

**قەتریب / qetrîb/:** ناو. پارچە ئامرازێکە لە ئەسپابی جووت 🇮🇷 ابزاری در خیش

**قەتعوبڕ / qet' û biř/:** ناو. کار و ڕەوتی باس و کێشەی شتێ بڕینەوە 🇮🇷 قول و قرار

◘ **قەتعوبڕ کردن:** قەرار و قسە و باسی شتێ بڕینەوە و ڕوون کردنەوەی هەموو بابەتێک 🇮🇷 قرار و مدار گذاشتن

**قەتقەت / qetqet/:** ئاوەڵکار. هەرگیزاوهەرگیز؛ بە هیچ شێوەیەک 🇮🇷 هیچگاە

**قەتک[1] / qet(i)k/:** ناو. ۱. خەیاری دێمەکار ۲. هەوسار؛ جڵەو 🇮🇷 ۱. خیار دیمی ۲. افسار

**قەتک[2]:** ئاوەڵکار. پیچەک؛ تۆزقاڵێ؛ نەختێ؛ کەمووکەیەک 🇮🇷 اندکی

**قەتڵاو / qetlaw/:** ناو. کڵاوی شەڕ؛ کڵاوخوود 🇮🇷 کُلاەخود

**قەتڵ / qet(i)ł/:** ناو. مرۆکوژی 🇮🇷 قتل

◘ **قەتڵ بڕینەوە:** *(کینایە)* لە خۆدان و گریانی بە کۆمەڵ لە بیرەوەری کوژرانی ئیمامی چوارەمی شیعەیاندا 🇮🇷 مراسم عزاداری حسینی راه انداختن

**قەتڵ کردن:** کوشتن؛ مراندن 🇮🇷 قتل کردن

**قەتماخە / qetmaxe/:** نـاو. قرماخـــە؛ قرماغـــە؛ قەتماغە؛ قرتماغە؛ قرتماخە: ١. قەشاوی؛ کـەپرە؛ کەپرۆکە؛ کەوەرە؛ قاشگ؛ توێ؛ بزمەتـە؛ بزماتـە؛ پەترۆ؛ پەترۆکە؛ پترۆک؛ توێژاڵـی مـردووی سـەر پێسـت (بـە هـۆی سـووتان یـان کـاری زۆرەوە) ٢. تـوێژی سـەر بـرین ‹قەتماخـە بـرین› ٣. *[مەجاز]* توێژاڵی وشکەوەبووی تراو لە سەر شت یان لەش ‹تـا پشـتێنەم قەتماخـەی خـوێنی شـەهیدە› 🇮🇷 ١. کبرە؛ خُشک ریشە ٢. خشکەی روی زخم ٣. لایـەی خشک شدەی مایع

⊡ **قەتماخە بەستن:** قەتماغـە بەسـتن؛ تـوێژ بـە سەردا هاتن 🇮🇷 کبرە زدن

**قەتماغە / qetmağe/:** 🖘 قەتماخە

⊡ **قەتماغە بەستن:** 🖘 قەتماخە بەستن

**قەتمەر / qetmer/:** ناو. مـۆر؛ بنەوشـی تاریـک 🇮🇷 بنفش تیرە

**قەتوف / qetuf/:** ناو. سـەوەتەی میـوە چـنین 🇮🇷 سبد میوە چیدن

**قەتۆ / qeto/:** ناو. پـاژ؛ لـەت؛ پارچـە 🇮🇷 قسـمت؛ سهم؛ بخش

**قەتەر / qeter/:** ناو. قەتارە؛ خشڵێکی سەری ژنانە 🇮🇷 از زینتآلات زنانە

**قەتەک / qetek/:** نـاو. ١. قەدەک؛ جاوێکی سـەوز کراوە ٢. ئامرازی تەتەڵە کردنی دانەوێڵە و تووتن 🇮🇷 ١. نوعی متقال سبز رنگ شدە ٢. وسـیلەی پـاک کردن توتون و تنباکو و غلات

**قەتی / qetî/:** 🖘 قاتوقڕی

**قەتیان / qetyan/:** چاوگ. قـەدیان؛ قـەدین: ١. نـەمان؛ تـەواوبوون؛ خـەلاس بـوون ٢. قرتیـان؛ بڕیان؛ پسان ٣. بەش/ دابـەش بـوون 🇮🇷 ١. تمـام شدن ٢. گُسستن ٣. تقسیم شدن

**قەتیز / qetîz/:** 🖘 قەتیس

**قەتیس / qetîs/:** ئاوەڵـناو. قەتیز: ١. بـێدەرەتـان؛ گیرکردوو ‹کچی نوور قەتیسی دەسی دێـوی کێـوە «سـوارە»› ٢. دامـاو؛ دەرمەنـە ٣. هەڵـتۆقیو؛ دەرپەڕیو لە لەش 🇮🇷 ١. گرفتار ٢. درماندە ٣. برآمدە

⊡ **قەتیس بون:** ١. گیر خواردن ٢. دامان؛ کەوتنە تەنگانە 🇮🇷 ١. گیر کردن ٢. درماندن

**قـەتیس کـردن:** گـیر دان؛ دەور لـێ گـرتن؛ دەرەتان لێ بڕین 🇮🇷 در تنگنا قرار دادن

**قەتیس مان:** بێدەرەتـان مـان ‹گـوتی: خێراکـە بڕۆین تۆ ڕزگار کەم بگەڕێمـەوە. سـەد تفـەنگچی بانەیی لە بـەفردا قـەتیس مـاون و ڕێ دەرناکـەن؛ نەیانگەمێ هـەموو قـڕ دەکـەن «هـەژار، چێشـتی مجێور»› 🇮🇷 بە تنگنا افتادن

**قـەتیسماو / qetîsmaw/:** ئاوەڵـناو. بـێدەرەتـان ‹جۆگەی ئاوەکان تیایا قەتیسماو/ هەر ئەڕۆن ناکەن پێچی شاخ تەواو «گۆران»› 🇮🇷 در تنگنا؛ گرفتار

**قەتین / qetîn/:** 🖘 قەتان

**قەتێ / qetê/:** نـاو. قـەتا؛ ڕیخـەخۆرە؛ کورکـوڕ 🇮🇷 سنگخوارە

**قەجەری / qecerî/:** ناو. ١. جۆرێ سـەرەتیری زۆر تیـژ و قـایم ٢. جـۆرێ کورتـانی یەکسـم ٣. ئەگریجە؛ بسکی سەر لاجـانگی ژنـان ٤. جـۆرێ سەرپۆشی سێگۆش ٥. جۆرێ قەیچیبڕ کـردنی پەرچووکە 🇮🇷 ١. نوعی پیکان ٢. نوعی پالان ٣. زُلف آویختە بین گوش و گونەی زنـان ۴. نـوعی روسـری سەگوش ۵. نوعی کوتاە کردن موی کاکُل

⊡ **قەجەری برینەوە:** هەڵـپاچینی سـەری بسـکی سەر لاجانگ بە شـێوەی قەجـەری 🇮🇷 قیچـی زدن سر زُلف بە شیوەی قجری

**قەجەڕە / qeceře/:** 🖘 قەدجەرە

**قەچاخ / qeçax/:** 🖘 قاچاخ

**قەچاخچی / qeçaxçî/:** 🖘 قاچاخچی

**قـەچم / qeç(i)m/:** نـاو. زەوت؛ ڕەوتی داگـــیر

کردن/ کران ☰ غصب

**قەچماندن / qeçmandin/**: چاوگ. داگیر کردن؛ زەوت کردن ☰ غصب کردن

**قەچۆ / qeço/**: ناو. کێرد؛ چەقۆ ☰ چاقو

**قەچوول / qeçûl/**: ناو. پیوی سووتاو ☰ پیه سوخته

**قەچیل / qeçîl/**: ئاوەڵناو. زۆر برژاو؛ بۆدراوی نیوەسووتاو ☰ نیم سوخته

**قەحبک / qeĥbik/**: ☜ قاحبە

**قەحبە / qeĥbe/**: ☜ قاحبە

**قەحبەباب / qeĥbebab/**: ناو. *[ناشیرین]* جوێنێکە ☰ پدرسوخته

**قەحبەچی / qeĥbeçî/**: ناو. *[ناشیرین]* ١. گەواد؛ قورمساخ؛ دەویت ٢. کەسێ کە هاتوچۆی لای قەحبە دەکا ☰ ١. جاکش ٢. جندەباز

**قەحت / qeĥt/**: ☜ قات[٢]

**قەحف / qeĥf/**: ناو. قاف؛ کاسەی سەر؛ ئێسکی کەللەسەر ☰ جُمجمه

**قەحفک / qeĥfik/**: ناو. ١. گلێنە؛ قاپی سوالەتی ٢. کدووی ناو بەتاڵ ☰ ١. ظرف گلین ٢. کدوی میان تُهی

**قەحفوور / qeĥfûr/**: ناو. جۆرێ سەبەتە ☰ نوعی سبد

**قەحەف / qeĥef/**: ناو. کاژەڵە؛ کاژەلاک ☰ جُمجُمه

**قەخپە / qexpe/**: ☜ قاحبە

**قەد[١] / qed/**: ناو. قەو؛ قەی: ١. بەژن؛ باڵا ‹بە سەروم وت کە راستە سەرکەش و بەرزی، کەچی لەرزی/ کە فەرقیشم بگاتە ئاسمان بەندەی قەدی یارم «نالی»› ٢. کەمبەر؛ نێوقەد ‹قەدی دار› ٣. لە زەمینەوە تا دەگاتە جێ لکی دار ‹کابرا بەو قەدەدا هەڵچوو› ٤. ڕێژێک سەرتاسەر لە دیراو ٥. قەدەر؛ ئەندازە ‹ڕوانیمە خوار چ ببینم؟ تیشە بەردێکە بە قەد خانووییێکی سێقاتی بلندە، گورگیش ناتوانێ لێی باز دا «هەژار، چێشتی مجێور»› ٦. توێ؛ لا ‹چوار قەد کەوتۆتەوە› ٧. دەق؛ تا ‹لێفەکە قەد کە!› ٨. نێوان داوێن و دوندی کێو ‹کۆترە شینکەی قەدی شاخی/ لوور بوونەوە ناو ئەشکەوت «هێمن»› ☰ ١. قامت ٢. کمر ٣. تنەی درخت ٤. یک ردەی سراسری از چوب آبیاری ٥. اندازه ٦. چین؛ لایە ٧. تا ٨. کمرکش کوه

⊡ **قەد کردن**: ١. لەت کردنی دار ٢. دەق کردن ☰ ١. قطع کردن چوب ٢. تا کردن

**قەد[٢]**: ناوەڵکار. قەت؛ چجار؛ هەرگیز ☰ هرگز

**قەدا / qeda/**: ناو. بەلا؛ بەسەرهاتی ناخۆش ☰ بلا؛ مُصیبت

**قەدارە / qedare/**: ناو. قەیارە؛ قەمە؛ غەدارە ☰ قداره

**قەدان / qedan/**: چاوگ. ١. دوایی هاتن؛ تەواو بوون ٢. جێبەجێ بوون ☰ ١. تمام شدن ٢. انجام گرفتن

**قەداندن / qedandin/**: چاوگ. ١. دوایی پێ هێنان؛ تەواو کردن ٢. جێبەجێ کردن ☰ ١. تمام کردن ٢. به انجام رساندن

**قەدباریک / qedbarîk/**: ئاوەڵناو. کەمەرباریک و لەبار ☰ کمر باریک

**قەدبڕ / qedbiř/**: ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. قەیبڕ؛ سەربڕ؛ قەوبڕ؛ ناڤبڕ؛ نێوبڕ ☰ میانبُر

**قەدبڵند / qedb(i)łind/**: ئاوەڵناو. کەڵەگەت؛ بالابەرز ☰ بلندقد

**قەدبەن / qedben/**: ☜ قەدبەند

**قەدبەند / qedbend/**: ناو. قەدبەن؛ کەمەربەند ☰ کمربند

**قەدپار / qedpar/**: ☜ قەدپاڵ

**قەدپاڵ / qedpał/**: ناو. قەدپار؛ گەوە؛ بەروال؛ بەروار؛ بروار؛ تیلەشان؛ وەندەن؛ بەندەن؛ کەزی؛ کەڤەر؛ کەلوو؛ کاش؛ لابەلا؛ لاپا؛ لاپار؛ لاپاڵ؛ بەرزاخ؛ گیدۆک؛ ناوقەدی کێو ☰ کمرکش کوه

**قەدجەرە / qedcere/:** ناو. خەوەشکێ؛ قەجەڕە؛ قەدجەڕە؛ دەمەکاوەکێ؛ ژاژک؛ باوێشک ☰ خمیازە

**قەدجەڕە / qedceře/:** ☜ **قەدجەرە**

**قەدر / qedr/:** ناو. ١. ڕێز؛ حورمەت؛ عیزەت ٢. بایەخ؛ ئەرزش ‹قەدری ددان وا بە لێوەوە «مەسەل»› ٣. قەد؛ ئەندازە ٤. قەیر؛ ماوە لە زەمان ☰ ١. عزّت؛ احترام ٢. ارزش ٣. اندازە ۴. مدت زمان

▣ **قەدر زانین:** ١. ☜ **قەدر گرتن** ٢. زانینی بایەخ و قەدری شتێک ‹ئەوان قەدری گەنجی خۆیان نەزانی› ☰ ١. ☜ **قەدر گرتن** ٢. ارزش چیزی را دانستن

**قەدر گرتن:** قەدر زانین؛ ڕێز و حورمەت لێنان ‹تا لە ژێر بازی ڕۆمیان نەمرن/ زەحمەتە قەدری بەیتی من بگرن «حاجی قادر»› ☰ عزّت و احترام گذاشتن

**قەدرگر / qedrgir/:** ناوەلناو. خاترناس؛ ڕێزگر ☰ احترام‌گذار

**قەدرگران / qedrg(i)ran/:** ناوەلناو. هێژا؛ ڕێزدار؛ زۆر بەڕێز و بەقەدر ☰ ارجمند

**قەدرناس / qedrnas/:** ناوەلناو. پێزان؛ ئەمەگ‌ناس؛ حەق‌ناس ☰ قدرشناس

**قەدرە / qedre/:** ☜ **قەیرە**

**قەدزراو / qedz(i)rav/:** ناوەلناو. بەلەباریک؛ قەدباریک؛ بەلەباریکە ☰ باریک‌اندام

**قەد ـ قەد / qed qed/:** ناوەلناو. ١. چین لە سەر چین ٢. پارچە ـ پارچە ☰ ١. چین ـ چین ٢. قطعە ـ قطعە

**قەدقەدۆک / qedqedok/:** ناو. گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ ☰ گیاهی دارویی

**قەدکراو / qedk(i)raw/:** ناوەلناو. دەقکراو؛ نوراشتی؛ نووشتاوە ☰ تاشدە

**قەدکراوی / qedk(i)rawî/:** ناو. نووشتاوی؛ دەق‌کریاگی ☰ تاشدگی

**قەدوبالا / qed û bała/:** ناو. بەژن و بالا ☰ قدوبالا

**قەدەح / qedeĥ/:** ناو. ١. پیالەی لە شیشە (بەتایبەت بۆ شەراب) ‹بلێن ساقی قەدەح پڕ کا/ شەرابی بێ‌ئەسەر نابێ «ویسالی»› ٢. گوڵی نارنج ☰ ١. قدح ٢. گُل نارنج

**قەدەخە / qedexe/:** ☜ **قەدەغە**

**قەدەر**[١] **/ qeder/:** ناو. ١. ئەندازە؛ قەدر ‹قسە لە قەدەر دەم و لەوست بکە! «مەسەل»› ٢. ماوە لە زەمان ‹قەدەرێک ئەنوەر دڵسۆزم لە جێگەی خۆم دانا، تا لە بەغدا دێمەوە «هەژار، چێشتی مجێور»› ٣. چارەنووسی خوایی ‹خەمی کۆنە بە با نادەم، خەمی تازە یەخەم ئەگرێ/ مەگەر دەستی قەدەر بێت و لە جەمعی خەم نەجاتم با «قانع»› ☰ ١. اندازە ٢. مُدت زمان ٣. قضا و قدر

▣ **قەدەرێ ئەولای:** ماوەیەک لەمەوبەر ☰ مدتی قبل

**قەدەرێ دی:** چەندێ لەمەوبەر ☰ چندی قبل

**قەدەرێکی دی:** ماوەیەک لەمەودوا ☰ مدتی بعد

**قەدەر**[٢]**:** ناوەلناو. توانا؛ بەهێز ‹کابرایەکی قەدەرە› ☰ قَدَر

**قەدەرئەیام / qeder'eyam/:** ناو. قەدەرعەیام؛ قەدەر؛ ماوەیێ لە ڕۆژگار ☰ مدت زمانی

**قەدەرعەیام / qeder'eyam/:** ☜ **قەدەرئەیام**

**قەدەغە / qedeğe/:** ناوەلناو. قاخە؛ قەدەخە: ١. پاوان ‹ئەم مێرگە قەدەغەیە› ٢. ناڕەوا؛ ڕێ‌نەدراو ‹قەدەغەیە بچییە ژوور›. هەروەها: **قەدەغە بوون؛ قەدەغە کردن** ☰ ١. قُرق ٢. ممنوع؛ قدغن

**قەدەک / qedek/:** ناو. جۆرێ خامی ڕەنگ‌کراو ☰ نوعی متقال رنگ‌شدە

**قەدەڵە / qedełe/:** ناو. جۆرێک دەفری فافۆنە، شیری تێدا دەکوڵێنن ☰ ظرفی آلومینیومی برای

جوشاندن شیر

**قـەدەم / qedem**/: نـاو. ١. هــەنگاو؛ شــەقاو ٢. هالاوی تیشکی هەتاو ٣. سەگی ڕاو لـە تـوخمی تاژی و دووڕەگ ☰ ١. گام ٢. هُرم آفتاب ٣. تیره‌ای از سگ شکاری

⊡ **قەدەم کردن:** هەڵم و تین هەستانەوە لـە زەوی، لەبەر گەرمای زۆر ☰ هُرم گرفتن زمین از شـدت گرما

**قەدەم لێدان:** پیاسە کردن ☰ قدم زدن

**قـەدەمخێر / qedemxêr**/: ئاوەڵـناو. پــێبــەخێر؛ پاوەخێر؛ تایبەتمەندی کەسێ کە هاتنی بە چاکە دەگرن ☰ خُجسته پی

**قەدەمشەڕ / qedemşeř**/: ئاوەڵناو. شووم؛ پاوەشـەڕ؛ پاڕەش؛ دژی قەدەمخێر ☰ بدقدم

**قەدەمـمـەڕی / qedemmeřî**/: نـاو. جۆرێــک ڕەوتی یەکسمە ☰ نوعی راه رفتن اسب

**قەدیان / qedyan**/: ☜ **قەتیان**

**قەدیفک / qedîfik**/: نـاو. مەرحەمە؛ خاولی؛ حەولە ☰ حوله

**قەدیفـە / qedîfe**/: نـاو. قەیفــە: ١. قــەدیفک؛ مەرحەمـە ٢. مەخمـەڵ؛ پارچـەی مەخمـەر ٣. گوڵێکە ☰ ١. حوله ٢. مخمل ٣. گُلی است

**قـەدیم / qedîm**/: نـاو. قــەییم؛ کــۆن؛ کــەونارا؛ لەمێژینە ☰ کُهنه؛ قدیم

**قـەدیمی**[1] **/ qedîmî**/: نـاو. قــەیمی؛ قــەییمی: پێشینیان ‹قەدیمی وتوویانە› ☰ گذشتگان

**قەدیمی**[2]: ئاوەڵـناو. قەیمی؛ قەییمی: ١. زۆر پیر ٢. زۆر لەمێژینە ☰ ١. سالخورده ٢. باستانی

**قەدین / qedîn**/: ☜ **قەتیان**

**قـەر / qer**/: ناو. ١. ☜ **قـەرز** ٢. ڕەش؛ سـیا ٣. *[باوەڕی کـۆن]* فریشــتەی بــەخت لــە ســیمای بنیادەمـدا ٤. سـووری ئامـاڵ‌ڕەش ٥. ئەنـدازە؛ قەدەر ٦. تارێتی؛ تاریکایی؛ تـاریکی ٧. خـووس؛ زوقم ☰ ١. ☜ **قەرز** ٢. سیاه ٣. فرشته‌ی بخت در صورت آدمی ۴. سرخ مایل بـه سیاه ۵. انـدازه ۶. تاریکی ۷. سرماریزه

⊡ **قەر بوونەوە:** بەر زگ ماسین ☰ شکم آماسیدن

**قەرا / qera**/: ناو. ١. ئەندازە؛ قـەد؛ قـەدر؛ قـەدەر ‹بە قەرا تۆ پووڵم بوایە لێرە نەبووم› ٢. ئۆقرە؛ ئارامی ☰ ١. اندازه ٢. آرامش

**قەرات / qerat**/: ☜ **قەڵات**

**قەراتە / qerate**/: ناو. ١. تارمایی؛ دۆڵـپا؛ تـاپۆ ٢. ☜ **قەڵاتە** ☰ ١. شبح ٢. ☜ **قەڵاتە**

**قەراج / qerac**/: ناو. ١. ☜ **قەلاچ ـ١** ٢. دارێکی جەنگەڵییە ☰ ١. ☜ **قەلاچ ـ١** ٢. درختی جنگلی

**قەراجـدار / qeracdar**/: نـاو. کۆچــەر؛ ڕەوەنــد؛ خێڵاتی ☰ کوچنشین

**قەراجەدار / qeracedar**/: ☜ **قەرەج**

**قەراچ / qeraç**/: ناو. بەردەڵان؛ ڕەقەن؛ تمتمان ☰ سنگلاخ

**قەراچۆ / qeraço**/: ☜ **قەڵاچۆ**

⊡ **قەراچۆ تێخستن:** کوشتنی گش‌لەگشتی دوژمن ☰ قتل‌عام کردن

**قەراخ / qerax**/: ☜ **قەراغ**

**قەراخبێجاخ / qeraxbêcax**/: نـاو. قـەراخوبیجـاخ؛ دەور و بەر؛ لاپەنا و پەراوێز ☰ دور و اطراف

**قـەراخبێچـاخ / qeraxbêçax**/: ئاوەڵـکار. دۆرانـدۆر؛ دەوراندەور؛ دەورتادەور ☰ پیرامون

**قەراخوبیجاخ / qerax û bîcax**/: ☜ **قەراخبێجاخ**

**قەرادە / qerade**/: ئاوەڵناو. شڕ و ڕزیوی بێ‌کەڵـک ☰ قُراضه

**قەرار / qerar**/: ناو. ١. بڕیار؛ پـەیمان. هـەروەها: **قەرار بوون** ٢. قەرا؛ ئـۆقـرە؛ ئـارامی ‹هـەر کـەس بێ‌تاوەن جە شەوق ئازیز/ کەی قەرار دارۆ تـا وەخـت پایز «شـێخ ئەحمـەدی تەختـەیی»› ☰ ١. وعـده ٢. آرامش؛ سکون

▣ **قەرار دان:** ١. قەرار دانان؛ بڕیار دان ‹قەرارمان دانا بڕۆین بۆ ماڵیان› ٢. لە شوێنێ دامەرزانـدن ☰ ١. مُقرر کردن ٢. در جایی مستقر کردن

**قەرار دانان:** ☜ **قەرار دان ـ١**

**قەرارداد / qerardad/:** ناو. ١. بـڕیار؛ بەڵـێن؛ پەیمان ٢. بڕیارنامە؛ بەڵێن‌نامە؛ پەیمان‌نامە ☰ ١. پیمان ٢. قرارداد

**قەرارگا / qerarga/:** ناو. مەکۆ؛ بنـەگا؛ بنکـە ☰ قرارگاه

**قەرارنامە / qerarname/:** ناو. قەوڵنامە؛ بڕیارنامە؛ بەڵێن‌نامە؛ گفت‌نامە؛ گرێبەست؛ نووسراوەیێ کە دوو یان چەند کـەس لـە سـەری پێکهـاتوون ☰ قولنامه

**قەراسە / qerase/:** ناو. نوێل؛ باری؛ لۆسە ☰ اهرُم

**قەراغ / qerağ/:** ناو. قـاراغ؛ قـراخ؛ قـەراخ؛ ڕەخ؛ کەنار؛ لێوار ☰ کناره

▣ **قەراغ بۆ تێ‌کردنەوە:** ١. کۆ کردنەوەی کلۆشـی دەور خەرمان لە کاتی گێرە کردنـدا ٢. *[کنایە]* لێـدان و سـزا دانی کەسـێک لـە سـەر تـاوان ‹تۆزێ قەراغی بۆ تێ‌نەکەمەوە، یاغی دەبێ› ☰ ١. جمع کردن غلەی اطراف خرمن ٢. تنبیه کردن

**قەراغ گرتن:** ١. پەراوێز لە جلک نـان ٢. هاتنـە لێواری ئاو ٣. دوورەپەرێزی کردن لـە خەڵـک ☰ ١. سجاف دوختن ٢. به ساحل آمـدن ٣. دوری کردن از مردم

**قەراغ لێ کێشان:** *[کنایە]* قسەی زیاد کردن و لـە سەر ڕۆیشتن ‹لەوە زیـاتر قـەراغی لـێ بکێشـێ، کلاومان تێکەڵ دەبێ› ☰ حرف اضافی زدن

**قەراغە / qerağe/:** ناو. ڕەخ؛ کەنار؛ لێـوار ☰ لبـە؛ کنارە

**قەرافل / qerafil/:** ناو. خـەزێم؛ غـەزێم؛ ئاڵـقەی نێوان کونەلووت بۆ جوانی ☰ زیور بینی زنان

**قەراقەرا / qeraqera/:** ☜ **قەرەقەرە**

**قەرام / qeram/:** ناو. قەپاخی چەرمین ☰ سرپوش چرمی ظروف

**قەران / qeran/:** ☜ **قران**[٢]

**قەرانتو / qerantû/:** نـاو. قـەرەنتوو؛ تارمـایی؛ ڕەشایی گیاندار لە دوورەوە ☰ شبح جاندار از دور

**قەراو / qeraw/:** ناو. ئاونگ؛ شەونم ☰ شبنم

**قەرپ / qerp/:** ☜ **قرپە**[٢]

**قەرپاچ / qerpaç/:** ناو. شـەلاخ؛ قـامچی؛ تازیانـە؛ قوپارچ ☰ تازیانه

**قەرپال / qerpal/:** ☜ **قرپاڵ**

**قەرپاڵ / qerpał/:** ناو‌ئاو. کەرپال؛ جلک‌قـەتیای؛ شڕ و شڕۆڵ ☰ ژنده‌پوش

**قەرپاندن / qerpandin/:** چاوگ. چاو داگرتن؛ چاو قرتان؛ هێما کردن بە چاو ☰ چشمک زدن

**قەرپک / qerpik/:** ناو. ١. مل؛ ئەسـتۆ ٢. پێسـیر؛ یەخە ☰ ١. گردن ٢. گریبان

**قەرپلاش / qerp(i)laş/:** ☜ **قالاو**

**قەرپوز / qerpuz/:** ناو. کالەک؛ گندۆرە ☰ خربُزه

**قەرپۆز / qerpoz/:** ☜ **قەرپۆس**

**قەرپۆس / qerpos/:** نـاو. قـەرپۆز؛ قـەرپووس؛ قەڵـپۆز؛ قەڵـپووز؛ قەڵـپووس؛ قـارپۆز؛ زەقـایی پێشەوەی زین ☰ قاچ زین

**قەرپۆل / qerpol/:** ئاو‌ڵناو. بە سەر یەکدا کەوتوو؛ لە سەر یەک کۆم‌کراو ☰ برهم انباشته

**قەرپووس / qerpûs/:** ☜ **قەرپۆس**

**قەرپەچە / qerpeçe/:** ناو. کاری لە ئامێز گـرتن و کوشین ☰ عمل در آغوش گرفتن و فشُردن

**قەرپیان / qerp(i)yan/:** چـاوگ. کـوێرە کـردن (وەک: گوللە و ...) ☰ عمل نکردن (گلوله و ...)

**قەرپینە / qerpîne/:** نـاو. قـەرەبینا؛ قەرەبینـە؛ قـەرەمینا؛ جـۆرێ دەمانچـەی قـەدیم ☰ نـوعی تپانچەی قدیمی

**قەرت[١] / qert/:** ناو. ١. خەرت؛ تەگـەی چوارساڵـە

٢. ☜ قەرز ☰ ١. تَکەی چهارساله ٢. ☜ قەرز

**قەرت**[٢]: ئاوەڵناو. ١. زبر؛ زوور ٢. پەیت؛ قایم ٣. لە بنەوە بڕاو ٤. نە پیر نە لاو؛ نێونجی لە تەمەندا ☰ ١. خشن؛ زبر ٢. مُحکم ٣. از بیخ بُریده ۴. میانسال

▣ **قەرت بوون:** ١. زبر/ زوور بوون ٢. بە تاقەت و توان بوون ٣. تووڕە بوون ٤. بڕان؛ بڕیان ☰ ١. زبر شدن ٢. قوی بوون ٣. عصبانی شدن ۴. قطع شدن

**قەرت کردن:** لە بنەوە بڕین ☰ از بیخ بُریدن

**قەرتاڤ / qertav/:** ناو. پوورە؛ شڵخەی هەنگ ☰ نسل تازەی زنبور عسل

**قەرتاڵ / qertał/:** ناو. قەرتەل؛ خەرتەل ☰ لاشخور

**قەرتاڵۆکە / qertałoke/:** ناو. ناڤبارک؛ ناڤباری پچووک ☰ سبد کوچک

**قەرتاڵە / qertałe/:** ناو. قەتوف؛ تریان ☰ سبد میوەچینی

**قەرتدار / qertdar/:** ناو. قەردار: ١. خاوەنواو ٢. دەیندار ☰ ١. طلبکار ٢. بدهکار

**قەرتەل / qertel/:** ☜ قەرتاڵ

**قەرتەمێر / qertemêr/:** ئاوەڵناو. ئازا و زبر ☰ شُجاع و خشن

**قەرتیش / qertîş/:** ناو. ١. کاژە؛ توێژەمار ٢. پێست و پوولەکەماسی ☰ ١. پوستەی انداختە شدەی مار ٢. پوست و پولک ماهی

**قەرجلگ / qercilg/:** ☜ قرژانك

**قەرچالە / qerçale/:** ئاوەڵناو. ترسنۆک؛ ترسەنۆک ☰ ترسو

**قەرچم / qerçim/:** ئاوەڵناو. چرچ و لۆچ (بۆ دەم و چاو) ☰ پرچین و چروک (صورت)

**قەرخ / qerx/:** ناو. کەرخ؛ ئەو بەرە وێنجە و گیایەی کە بە یەک زەبری کەرەنتوو دەدروێتەوە ☰ علفی کە با یک ضربەی داس بلند درو شود

**قەرد / qerd/:** ☜ قەرز

**قەردار / qerdar/:** ☜ قەرتدار

**قەرز / qerz/:** ناو. قەر؛ قەرت؛ قەرد؛ وام؛ دەین؛ واو؛ دەستەواو ☰ وام؛ قرض

▣ **قەرز خواردن:** نەدانەوەی دەین ☰ پس ندادن وام

**قەرز دان:** ئەمانەت دان؛ ئەمانەتی شتێک بە کەسێک دان ☰ قرض دادن

**قەرز دانەوە:** وام بە خاوەن وام وەگەڕاندن ☰ ادا کردن وام

**قەرز کردن:** وام وەرگرتن ☰ قرض گرفتن

**قەرزار / qerzar/:** ☜ قەرزدار

**قەرزاری / qerzarî/:** ☜ قەرزداری

**قەرزدار / qerzdar/:** ئاوەڵناو. قەرزار؛ وام لە سەر ☰ بدهکار؛ وامدار

**قەرزداری / qerzdarî/:** ناو. قەرزاری؛ دەینداری ☰ بدهکاری؛ وامداری

**قەرزکوێر / qerzk(i)wêr/:** ئاوەڵناو. قەرزکۆر؛ تایبەتمەندی کەسێ کە دانەوەی قەرز وە درەنگ دەخا ☰ بدحساب

**قەرزکۆر / qerzkor/:** ☜ قەرزکوێر

**قەرزوقۆڵە / qerz û qołe/:** ناو. دەینی بڵاو؛ وامی پرژ ☰ قرض‌وقوله

**قەرژنگ / qerjing/:** ☜ قرژانگ

**قەرس**[١] **/ qers/:** ناو. ١. ڕەوتی توند بوونی شتی تراو ٢. بەراورد؛ خەمڵ؛ قرس ☰ ١. فرآیند بند آمدن مایع ٢. برآورد

**قەرس**[٢]: ☜ قەڵس

**قەرسان / qersan/:** چاوگ. ١. قەرس بوون؛ توند بوونی تراو ٢. بەراورد بوون ☰ ١. بند آمدن مایع ٢. برآورد شدن

**قەرساندن / qersandin/:** چاوگ. ١. مەیاندن؛ توند کردنی تراو ٢. بەراورد کردن ☰ ١. بند آوردن مایع ٢. برآورد کردن

**قەرساو / qersaw/**: ئاوەڵناو. خەملاو؛ بەراوردکراو ▣ برآوردشده

**قەرسوون / qersûn/**: ناو. جۆرێ گۆزە ▣ نوعی کوزه

**قەرسەقول / qersequl/**: ناو. قارسەقول؛ قەستەقول؛ تەرسەقول؛ خەرسەخول؛ خەرسەقول؛ ڕیاوی چارەوێ ▣ سرگین

**قەرسیل / qersîl/**: ناو. قەسیل؛ قەیسیل: ١. لاسکە دەخڵی سەوز ٢. سەوەڵ؛ بەرماوی لەوەڕ ▣ ١. ساقەی سبز غله ٢. پسماندەی چرا

**قەرسین / qersîn/**: چاوگ. مەین؛ قەرسان؛ تووند بوونی تراو ▣ بستن؛ بندآمدن مایع

**قەرسینک / qersînk/**: ناو. بەفرینگ؛ فریزر؛ کەرەستەیەکی ڕچێنەری کارەباییی وەک یەخچاڵ، کە ماکی خۆراکی (زۆرتر گۆشت) دەرچێنێ و ڕایدەگرێ ▣ فریزر

**قەرسێن / qersên/**: ناو. خەملێن؛ بەراوردکەر ▣ برآوردکننده

**قەرش / qerş/**: ناو. قەڵش؛ قڵیش؛ تلیش ▣ شکاف

▣ **قەرش بردن**: قەرشان؛ قەڵشان؛ تلیشیان ▣ شکافتن

**قەرشان / qerşan/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //قەرشای؛ دەقەرشێی؛ بقەرشێ// قەرشین؛ تلیشان؛ قەرش بردن ▣ شکافتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: قەرشاو/ چاوگی نەرێنی: نەقەرشان

**قەرشاندن / qerşandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //قەرشاندت؛ دەقەرشێنی؛ بقەرشێنە// تلیشاندن؛ قەرش پێ بردن ▣ شکافتن

**قەرشاو / qerşaw/**: ئاوەڵناو. قەرشیو؛ قەڵشاو؛ تلیشیاگ ▣ شکافته

**قەرشیان / qerşyan/**: ☜ **قەڵشان**

**قەرشین / qerşîn/**: ☜ **قەرشان**

**قەرشیو / qerşîw/**: ☜ **قەرشاو**

**قەرغوو / qerğû/**: ناو. جۆرێ قامیشی ڕەق و ئەستوور کە بلوێری لێ دروست دەکەن ▣ نوعی نی که نی‌لبک از آن می‌سازند

**قەرف[1] / qerf/**: ناو. ١. حەنەک؛ گاڵتەی بە قسە ٢. فڕ؛ کەترە؛ هەجو؛ جنێوی زۆرتر بە شیعر ▣ ١. شوخی ٢. هَجو

**قەرف[2]**: دەنگەناو. دەنگی شکانی داری وشک ▣ صدای شکستن درخت خُشک

**قەرفۆک / qerfok/**: ئاوەڵناو. ١. حەنەکچی؛ شۆخیباز ٢. فڕاوێژ؛ فڕباز ▣ ١. لوده ٢. هجوکننده

**قەرفین / qerfîn/**: چاوگ. ١. قسەی حەنەک کردن ٢. تیز کردن ٣. شکانی دار وێڕای دەنگی تایبەت ▣ ١. شوخی کردن ٢. تَشَر زدن ٣. شکستن درخت همراه با صدای آن

**قەرقاش / qerqaş/**: ئاوەڵناو. سپی دەوری چاو ڕەش (پەز) ▣ سفید دور چشم سیاه (گوسفند)

**قەرقاو / qerqaw/**: ☜ **قەرقاوڵ**

**قەرقاوڵ / qerqawił/**: ناو. قەرقاو: ١. تۆرەمەیەک باڵندەی وشکانین، لاقیان تووکی نییە، باڵیان کورتە، کاتی فڕین فڕەی باڵیان دێ، چەن جۆریان هەیە کە بریتین لە: پۆڕ، زرەپۆڕ، سوێسکە، کەودەری و هەوێردە ٢. چۆڕ؛ چۆڕپۆڕ؛ تەرەزوو؛ کەڵەشێری کێوی؛ کەڵەشێری دارستان، باڵندەیەکە لە تۆرەمەی قەرقاوڵ، سەربەکاکۆڵ، کلک درێژ و ڕەنگامەیە، لە مریشک گەورەترە و لە لێڕەواردا دەژی ▣ ١و٢. قرقاول

**قەرقلیت / qerq(i)lît/**: ☜ **قەرەقرووت**

**قەرقۆت / qerqot/**: ناو. خرتەوپرتە؛ شڕەوبڕەی ناوماڵ ▣ خرت‌وپرت؛ اثاثیه

**قەرقوو / qerqû/**: ناو. شەرا؛ گەنم و نۆکێ کە بەر لە گەیشتنی وشک بێ ▣ گندمی که قبل از رسیدن بخشکد

**قەرقووش** / qerqûş/: ناو. قەرەقوش؛ نەخۆشییەکی سمی ئەسپە ناتوانێ لە سەر عەرزی دابنێ 🇮🇷 بیماری سُم اسب

**قەرقە** / qerqe/: ناو. خەلات؛ کفن؛ بالاپۆشی مردوو 🇮🇷 کفن

**قەرقەدانلدن** / qerqedandin/: چاوگ. تەمەن رابواردن؛ ژیان تێپەڕ کردن. هەروەها: **قەرقەدان** 🇮🇷 گذراندن؛ به سر بُردن

**قەرقەش** / qerqeş/: ☜ **قەرقەشە**

**قەرقەشە** / qerqeşe/: ناو. قەرقەش: ١. دژواری و نارەحەتی لە ژیاندا ٢. تەشقەڵە؛ گزی؛ گێچەڵ 🇮🇷 ١. مُشکلات زندگی ٢. شلتاق

**قەرقەل** / qerqel/: ناو. کفن؛ کەفەن؛ جامەمەرگ 🇮🇷 کفن

**قەرقەمێ** / qerqemê/: ناو. مەشکۆڵە؛ خێگەڵە؛ پێستەی میوە تێدا ئاخنین 🇮🇷 خیک جای آکندن میوە

**قەرقیت** / qerqît/: ناو. بەلەچەک؛ تاسمە؛ کوولەکەی وشککراو بۆ زستان 🇮🇷 کدوخُشکە

**قەرم** / qerm/: ☜ **قەرەمە**

**قەرماندن** / qermandin/: چاوگ. ماندوو/ شەکەت کردن 🇮🇷 خستە کردن

**قەرمچ** / qermiç/: ناو. قرچ؛ چرچ 🇮🇷 چروک

**قەرمچاندن** / qerm(i)çandin/: چاوگ. قورمچاندن: ١. ورد کردن؛ هاڕین ٢. چین - چین و لۆچدار کردن ‹جانتەیێ من کراسێن من قەرمچاند، دڤێ ئەز وان ئوتوو بکەم› 🇮🇷 ١. خُرد کردن ٢. چروک کردن

**قەرمچۆک** / qerm(i)çok/: ناو،ئاوەڵناو. قەرمیچۆنگ؛ لۆچ؛ چرچ؛ گنج ‹ڕوویێ وی تژی قەرمچۆک بوویە› 🇮🇷 چروک

**قەرمچی** / qerm(i)çî/: ئاوەڵناو. ١. قرچاو؛ هەڵقرچاو ٢. چرچاو؛ چرچیاگ 🇮🇷 ١و٢. چروکیدە

**قەرمچین** / qerm(i)çîn/: چاوگ. ١. ورد بوون ٢. قرچ هەلاتن؛ چرچولۆچ تێکەوتن ‹ڕوویێ مرۆڤێن پیر قەرمچییە› 🇮🇷 ١. خُرد شدن ٢. چروکیدن

**قەرملاندن** / qerm(i)landin/: چاوگ. ١. ماندوو/ شەکەت کردن ٢. لێ تێکدان؛ سەرلێشێواندن 🇮🇷 ١. خستە کردن ٢. گُمراە کردن

**قەرملین** / qerm(i)lîn/: چاوگ. ١. ماندوو بوون ٢. لێ تێکچوون؛ سەرلێشێوان 🇮🇷 ١. خستە شدن ٢. گُمراە شدن

**قەرمووشک** / qermûşik/: ناو. چنگورک؛ پەنجەی دڕندە و گیانەوەری وەک پشیلە 🇮🇷 چنگال درندە

**قەرمەلاخ** / qermelax/: ناو. پۆلێکی گەورە لە باڵدار 🇮🇷 گروهی بزرگ از پرندگان

**قەرمیت** / qermît/: ناو. تایل؛ سواڵەت؛ کاشووڵ؛ ئەو کاشووڵانەی سەری خانووی پێ دەگرن 🇮🇷 سُفال

**قەرمیچۆنگ** / qermîçong/: ☜ **قەرمچۆک**

**قەرنەفل** / qernefil/: ☜ **قەرەنفول**

**قەرنی** / qernî/: ☜ **قرنو**

**قەرنیز** / qernîz/: ناو. هێرە؛ ڕیزەخشتێ کە زۆپتر لە سەر هیم و گوێ بانان دادەنرێ 🇮🇷 هرە؛ قرنیز لبِ بام

**قەرواش** / qerwaş/: ☜ **قەرەواش**

**قەرواقە** / qerwaqe/: ☜ **قرپۆق**

**قەروێلە** / qerwêle/: ☜ **قەرەوێلە**

**قەرۆن** / qeron/: ناو. یارییەکی منداڵانەیە 🇮🇷 از بازی‌های کودکانە

**قەرە**[1] / qere/: ناو. ١. ڕەش؛ سیا ٢. سووری ئاماڵڕەش ٣. بنەمای بیانوو؛ هۆی تەشقەڵە ‹ئەمەی بۆ قەرە کردووە دەیەوێ هەرچۆنێ بووە بچێ› ٤. ڕەشایی؛ ڕەعیەتی بێجووتوگا ٥. چەڵتووکجاڕ؛ مەرەزە ٦. قەراتە؛ تارمایی؛ تاپۆ؛ شتی خەیاڵی کە دێتە بەرچاو ٧. سۆسە؛

چۆنیەتی بۆچوون و هەست بە جێگەی گومبوو کردن ٨. تاریکی؛ ڕەشایی ٩. لکی تازەی یەکسالان 🇮🇷 ١. سیاه ٢. سُرخ مایل بە سیاه ٣. دستاویز ٤. خوش‌نشین ٥. شالیزار ٦. شبح ٧. حالت سُراغ کردن ٨. تاریکی ٩. جوانەی یکساله

⊡ **قەرە کردن:** سۆراغ کردن؛ سۆسە کردن؛ بەحال دیتن ‹زۆر دوورە، قەرەی ناکەم› 🇮🇷 بە سختی دیدن

**قەرە وە قەرە شوێن کەسێ کەوتن:** بە شوێن کەسێکدا چوون و چاو لێ دانەخستنی 🇮🇷 قدم به قدم کسی را تعقیب کردن

**قەرە**[٢]: ناوەڵناو. ١. ڕام؛ کەوی؛ فێر ٢. چێشتەخۆرە ٣. فەریک؛ کاڵ؛ نەگەیشتوو 🇮🇷 ١. رام ٢. چشته‌خور ٣. نارس

⊡ **قەرە بوون:** ١. ڕام بوون؛ کەوی بوون ٢. چێژە بوونی نچیر 🇮🇷 ١. رام شدن ٢. چشته‌خور شدن شکار

**قەرە**[٣]: ئامراز. قەمچ؛ نزیکی؛ تخوون 🇮🇷 طرف

⊡ **قەرە نەدان:** ☜ **قەرە نەکەوتن**

**قەرە نەکەوتن:** قەرە نەدان؛ تخوون نەکەوتن؛ بە لادا نەچوون؛ نزیک نەبوونەوە ‹ئامانە قەرەی بێ‌حەیا نەکەوی!› 🇮🇷 نزدیک نشدن

**خۆ لە قەرەی شتێ/ کەسێ نەدان:** تخوون کەسێ/ شتێ نەکەوتن؛ بەرەو لای کەسێ یان شتێ نەچوون ‹دوکتور دەڵێ خوێ لە قەرەی خوێ و چەوری نەدەم!› 🇮🇷 طرف چیزی یا کسی نرفتن

**قەرە ـ**[٤]: پێشوشە. ١. ڕەش ‹قەرەقوش› ٢. خراب ـ چەوت ‹قەرەمێوک› ٣. سووک؛ خوار ‹قەرەپووڵ› 🇮🇷 ١. سیاه ٢. نامرغوب ٣. بی‌ارزش

**قەرەئەفتاوە** / qere'eftawe/: ناو. حەوجۆش؛ لوولێنەی مەفرەق 🇮🇷 آفتابەی مسی

**قەرەباچکە** / qerebaçke/: ☜ **قشقەرە ـ١**

**قەرەبارغ** / qerebariğ/: ☜ **قەرەباڵغ**

**قەرەباش** / qerebaş/: ☜ **قەرەواش**

**قەرەباغی** / qerebağî/: ناو. هەوایەکی گۆرانی کوردییە 🇮🇷 آهنگی کُردی

**قەرەبالغ** / qerebaliğ/: ☜ **قەرەباڵغ**

**قەرەباڵغ**[١] / qerebałiğ/: ناو. قەرەبارغ؛ قەرەبالغ؛ قەلەباڵغ؛ شلۆقی و جەنجاڵ 🇮🇷 ازدحام

**قەرەباڵغ**[٢]: ناوەڵناو. قەرەبارغ؛ قەرەبالغ؛ قەلەباڵغ؛ پڕقاڵەقاڵ ‹تەنیایی من قەرەباڵغە «شێرکۆ»› 🇮🇷 پُرهیاهو

**قەرەباڵغی** / qerebał(i)ğî/: ناو. ترافیک؛ شلۆقی؛ جەنجاڵی 🇮🇷 ترافیک

**قەرەبرووت**[١] / qereb(i)rût/: ناو. بارووتی ڕەش 🇮🇷 باروت سیاه

**قەرەبرووت**[٢]: ناوەڵناو. ١. سووتاوی زۆر سووتار ٢. *[کینایە]* زۆر وشکەوەبووگ 🇮🇷 ١. کاملاً سوخته ٢. بسیار خشکیده

**قەرەبوو** / qerebû/: ناو. قەرەوی؛ ئەقرەوی؛ ئەقرەوە؛ چێرە؛ ئاڤدەیی؛ کارێک لە وەرامی کارێکی‌تر و هەر بەو مەبەستەوە ‹ویستی بە دیارییەک چاکەی قەرەبوو کاتەوە› 🇮🇷 تلافی؛ جُبران

⊡ **قەرەبوو دانەوە:** ☜ **قەرەبوو کردنەوە**

**قەرەبوو کردن:** ☜ **قەرەبوو کردنەوە**

**قەرەبوو کردنەوە:** قەرەبوو دانەوە؛ قەرەبوو کردن: ١. ئەقرەوی کردن؛ بۆ بژاردنەوە؛ تێ‌هەڵێنانەوە ٢. تۆڵە کردنەوە؛ وەرامی کارێک وەک خۆی دانەوە 🇮🇷 ١و٢. تلافی کردن

**قەرەبەخت** / qerebext/: ناوەڵناو. قەرەبەش؛ چارەڕەش؛ کلۆڵ؛ بەدبەخت 🇮🇷 سیەبخت

**قەرەبەختی** / qerebextî/: ناو. خاکەساری؛ بەلەنگازی؛ کلۆڵی 🇮🇷 شوربختی

**قەرەبەربانگ** / qereberbang/: ناو. بوومەلێڵە؛ تاریک و ڕوونی بەیان 🇮🇷 سپیده‌دم؛ فجر کاذب

**قەرەبەش**[١] / qerebeş/: ☜ **قەرەبەشە**

**قەرەبەش**[٢]: ناوەڵناو. ١. ☜ **قەرەبەخت** ٢. ڕوخسار ڕەش و سپی تێکەڵاو (ئاژەڵ) ■ ١. ☜ **قەرەبەخت** ٢. صورت سفید و سیاه (گوسفند)

**قەرەبەشە** / qerebeşe/: ناو. قەرەبەش؛ مراوی ڕەش ■ مُرغابی سیاه

**قەرەبینا** / qerebîna/: ☜ **قەرپینە**

**قەرەبینە** / qerebîne/: ☜ **قەرپینە**

**قەرەپشی** / qerep(i)şî/: ناو. چەتە؛ ڕێگر؛ ڕێبڕ؛ جەردە ■ راهزن

**قەرەپوڵ** / qerepûł/: ناو. ١. پارەی ورد ٢. جۆرێ برینی بە قرتماخە لە پشتی یەکسم ■ ١. پول خُرد ٢. نوعی زخم بر پُشت ستور

**قەرەپەست** / qerepest/: ناو. قەرەپەستۆک؛ قەرەپەستە؛ کاری بە زۆر تێئاخنین ‹جوان بیشێلە، قەرەپەستی کە!› ■ عمل با فشار آکندن

**قەرەپەستۆک** / qerepestok/: ناو. ١. ☜ قەرەپەست ٢. دەلەک؛ پاڵەپەستۆ ■ ١. ☜ قەرەپەست ٢. هُل

**قەرەپەستە** / qerepeste/: ☜ **قەرەپەست**

**قەرەتون** / qeretûn/: ناو. خواردنی فرە زووی بەیانی (جگە لە قلیانقاوڵتی) ■ پیش صبحانە

**قەرەتی** / qeretî/: ناوەڵناو. ئەمانەتی ■ امانی

**قەرەج** / qerec/: ناو. قەرەچ؛ قەرەچی؛ قەرەجان؛ قەراجەدار؛ کۆچەر؛ کاولی؛ کاولی؛ کاوەلی؛ کەولی؛ کوولی؛ هەر یەکە لە کەسانی خێوەتنشین یان گەڕۆک لە هۆزی هیندی، تۆرەمەی ئاریایی، کە بە دنیادا بڵاو بوونەتەوە و زۆرتر لە ڕێگەی ئاواز خوێندن، ساز ژەندن، بەڕێوەبردنی شانۆی گەڕۆک و کاری دەستی و ئاژەڵدارییەوە دەژین ■ کولی

**قەرەجان** / qerecan/: ☜ **قەرەج**

**قەرەچ** / qereç/: ☜ **قەرەج**

**قەرەچناخ** / qereç(i)nax/: ناوەڵناو. دەمهەراش؛ زۆربێژی بێحەیا ■ پُرگوی پُررو

**قەرەچناغ** / qereç(i)nağ/: ناوەڵناو. *[پلار]* قەرەچەناخ؛ قەرەچەناغ؛ قەرەزاخ؛ چەقەسرۆ؛ زۆرویژ؛ چەنەبازی بێ ئابڕوو ■ پُرگوی پُررو

**قەرەچور** / qereçur/: ناو. جۆرێ شمشێری دەمخوار ■ نوعی شمشیر خمیده

**قەرەچۆران** / qereçoran/: ناو. سوارەی ئاگاداری ڕێوبانان ■ سوار مُحافظ راەها

**قەرەچۆڵ** / qereçoł/: ناو. ١. بیاوانی زۆر پان و بەرینی بێگیا و ئاوەدانی ٢. دوامین کەسی لە عەشرەت ماو ■ ١. بیابان برهوت ٢. آخرین بازمانده از عشیرت

▣ **قەرەچۆڵ بریان**: تاق بریان؛ شتاق نەمان ■ مُنقرض شدن

**قەرەچەناخ** / qereçenax/: ☜ **قەرەچناغ**

**قەرەچەناغ** / qereçenağ/: ☜ **قەرەچناغ**

**قەرەچی** / qereçî/: ناوەڵناو. ١. سەر بە خێڵی قەرەج ٢. *[پلار]* قەرەچناخ؛ بێئابڕوو ■ ١. کولی ٢. پُرگوی پُررو

**قەرەچیەکۆڵە** / qereç(i)yekołe/: ناوەڵناو. *[کینایە، پلار]* بێشەرم و حەیا ■ بی‌حیا

**قەرەچییەتی** / qereçîyetî/: ناو. *[کینایە، پلار]* ڕووداری و بێحەیایی ■ کولی‌بازی

**قەرەچێوە** / qereçêwe/: ناو. داربەستی مال کردنەوە ■ داربست بنایی

**قەرەخان** / qerexan/: ناو. گیایەکە دەیستووتێنن و خۆڵەمێشەکەی لە ئاودا دەکوڵێنن و هێشووە ترێی تێهەڵدەکێشن و هەڵیدەخەن دەبێتە کشمیش ■ گیاهی است

**قەرەخرچە** / qerexirçe/: ناو. خرچە؛ نەگەیشتووی کاڵەک بە شلکی ■ خربُزەی کال

**قەرەخرمان** / qerexirman/: ☜ **قەرەخەرمان**

**قەرەخەرمان** / qerexerman/: ناو. قەرەخرمان؛

قەلەخەرمان: ١. فەریکە دەخلی برژاو ٢. *[مەجاز]* بۆن یان دووکەڵی خەست ☰ ١. غلەی دلمل بوداده ٢. بو یا دود غلیظ

**قەرەدار / qeredar/**: ناو. جۆرێ داری هەمیشە شین و گەڵادەرزی ☰ درختی از گروه کاجیان

**قەرەداشی / qeredaşî/**: ناو. جۆرێ هەڵپەڕکێ ☰ نوعی رقص گروهی

**قەرەزاخ / qerezax/**: ئاوەڵناو. ١. زۆر گرینۆک ٢. ☜ **قەرەچناغ** ☰ ١. همیشه گریان ٢. ☜ **قەرەچناغ**

**قەرەس / qeres/**: ناو. گێلاس؛ گلیار؛ گەلاز ☰ گیلاس

**قەرەساو / qeresaw/**: ناو. گیای لێکهاڵاو بۆ بەندی ئاو دابەستن ☰ گیاه بە هم پیچیده برای مهار آب

**قەرەسون / qeresûn/**: ناو. دەفری لە سواڵەتی دەمهەراو ☰ خُم گلین دهان گشاد

**قەرەسەقەل / qereseqel/**: ناو. ناوی گیایەکە ☰ گیاهی است

**قەرەسەو / qeresew/**: ناو. جۆرێ تونگەی لە مس ☰ نوعی تُنگ مسین

**قەرەفتێڵە / qeref(i)têle/**: ناو. چرای پیوسۆز ☰ چراغ فتیله

**قەرەفیسکان / qerefîskan/**: چاوگ. هەڵترووشکان؛ جنیچکە دان ☰ جُمباتمه زدن

**قەرەفیل / qerefîl/**: ناو. خەزێمی لووت ☰ حلقەی زینتی بینی

**قەرەقاچ / qereqaç/**: ناو. ناوی دەوەنێکە ☰ درختچەای است

**قەرەقاژر / qereqajir/**: ئاوەڵناو. قەرەزاخ؛ گرینۆک ☰ همیشه گریان

**قەرەقاوت / qereqawit/**: ناو. گیایەکە لە قامیش دەچێ ☰ گیاهی است

**قەرەقاوڵە / qereqawłe/**: ناو. مەرەکێوی؛ پەزەکێفی ☰ گوسفند کوهی

**قەرەقرووت / qereq(i)rût/**: ناو. قەرقلیت؛ کەشکێکی ڕەش و ترش کە لە کوڵاندنی ئاوی ماست بەرهەم دێ ☰ قراقوروت

**قەرەقوش / qerequş/**: ناو. هەڵۆی ڕەش ☰ عُقاب سیاه

**قەرەقوشی / qerequşî/**: ناو. لاساری؛ کار و ڕەوتی سەر بە خۆ حوکم کردن ☰ دیکتاتوری

**قەرەقۆز / qereqoz/**: ناو. پاڵەوانی بێناو و نیشان ☰ پهلوان گمنام

**قەرەقۆل / qereqol/**: ناو. ئەو پاڵەی هەر درواوی پاڵەی تر کۆ دەکاتەوە ☰ دروگری کە درویدەی دیگری را جمع میکند

**قەرەقۆڵ / qereqoł/**: ناو. پاڵەی گیا دروون؛ کەسێ کە بە داس گیا دەدروێ ☰ دروگر با داس دستەکوتاه

**قەرەقووچ / qereqûç/**: ناو. تووتە؛ گوولاتی؛ قامکەچکۆڵە ☰ خنصر؛ انگشت کوچک

**قەرەقەرە / qereqere/**: ناو. قەراقەرا؛ قەرەقەرێ؛ قەرێقەرێ؛ گەمەی چاوشارکێ ☰ بازی قایم موشک

**قەرەقەرێ / qereqerê/**: ☜ **قەرەقەرە**

**قەرەڵوو / qerełû/**: ناو. قەرەڵی؛ هەڵووژەڕەشە ☰ آلو سیاه

**قەرەڵی / qerełî/**: ☜ **قەرەڵوو**

**قەرەم / qerem/**: ناو. ١. قەڵەم؛ پێنووس ٢. ☜ **قەڵەمە ـ١** ٣. بەهرە؛ فایدە ٤. بێشەی چڕ ☰ ١. قلم ٢. ☜ **قەڵەمە ـ١** ٣. بهره ۴. بیشەی انبوه

**قەرەمات / qeremat/**: ئاوەڵناو. عەجیب؛ سەیر و سەمەرە ☰ عجیب

**قەرەماچ / qeremaç/**: ناو. ناوی پەڕێکە لە پەڕەکانی پاسوور ☰ از ورقهای پاسور

**قەرەمان** / qereman/: ☜ **قارەمان**

**قەرەمە** / qereme/: ناو. قەرەم؛ قەرم؛ داررووکەی بێ ڕیشە بۆ چاندن ▀ قلمه

**قەرەمینا** / qeremîna/: ☜ **قەرپینە**

**قەرەمێوک** / qeremêwik/: ناو. قوونێری داری ترێ کە بەر ناهێنێ و فڕێ دەدرێ ▀ پاجوش تاک کە هرس می‌شود

**قەرەن** / qeren/: ☜ **قالان**

**قەرەناز** / qerenaz/: ناو. باڵدارێکی کۆچەرە لە دەم ئاوان دەژی، لاقی درێژ و دندووکی خوارە، پەڕ و باڵی قاوەیی مەیلەو ڕەشە، زۆرتر لەگەڵ شاوە و لەگ‌لەگ دەبینرێ ▀ اکراس سیاه

**قەرەنتو** / qerentû/: ☜ **قەرانتو**

**قەرەنفل** / qerenfil/: ☜ **قەرەنفول**

**قەرەنفول** / qerenful/: ناو. قرنفل؛ قەرنەفڵ؛ قەرەنفل؛ قەنەفڕ؛ قەنەفڵ؛ ڕووەکێکە لە تیرەی مێخەک، گوڵی بچووکی مەخمەڵی پێنجپەڕ بە ڕەنگی سپی، سوور، بەنەوش، ئاڵی کاڵ و تێکەڵێک لە سپی و سوور دەکا کە بە چڕی لە کۆگوڵێکدا وەک چەتر دەردەکەوێ ▀ قرنفل

**قەرەنەی** / qereney/: ناو. نەیارەش؛ کلارینێت؛ سازێکی بازەنی درێژ بە سەری دەندووکەیی، بنی گوشاد و ژمارەیەکی زۆر کون و کلیلەوە ▀ قرەنی

**قەرەنیە** / qeren(i)ye/: ناو. کاری دووهەمین کوتانی چەڵتوک بە دنگ ▀ عمل دوبارە کوبیدن شالی در دنگ

**قەرەو** / qerew/: ☜ **قەڵەو**

**قەرەواش** / qerewaş/: ناو. قەرواش؛ قەرەباش؛ کلفەت؛ ژنی کارەکەری ماڵ ▀ خدمتکار؛ کُلفت خانە

**قەرەوانە** / qerewane/: ناو. قەرەوانی: ١. دەفری شێو تێدا خواردنی سەربازان ٢. کتری لە تەنەکە بۆ چای لێنانی شوان ▀ ١. ظرف غذاخوری سربازی ٢. کتری حلبی چوپان

**قەرەوانی** / qerewanî/: ☜ **قەرەوانە**

**قەرەوقوتە** / qere w qûte/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* فەقیر و هەژاری لادێ ▀ بینوای روستایی

**قەرەوڵ** / qerewił/: ناو. ١. پاسدەر؛ ئێشکگر ٢. سێرەی تفەنگ ٣. نیشانە؛ کێلک ٤. خشتی قیت بۆ نیشان کردنی ژمارەیەک خشتی بڕاو ▀ ١. نگهبان ٢. مگسک تُفنگ ٣. نشان؛ هدف ۴. آجر نشانەی آجرپزی

⊡ **قەرەوڵ گرتن:** بەرەو نیشانە ڕێک کردنی تفەنگ ▀ نشانە گرفتن

**قەرەوڵخانە** / qerewiłxane/: ناو. بنکەی پاسدەران ▀ پُست نگهبانی

**قەرەونە** / qerew(i)ne/: ناو. ١. کرمی ناو میوەی وشک ٢. کرمی کەشک ▀ ١. کرم میوەی خشک ٢. کرم کشک

**قەرەوەقەرە** / qere we qere/: ئاوەڵکار. شوێن بە شوێن؛ بێ چاوڵێداخستن و شوێنگوم‌کردن ‹هەر ئەو ڕۆیشت، قەرەوەقەرە کەوتمە شوێنی› ▀ گام‌بەگام

**قەرەوی** / qerewî/: ناو. ١. ☜ **قەرەبوو** ٢. قەڵەوی؛ چاخی؛ گۆشتنی ٣. فاتەبۆر؛ جۆرێ کاڵەک ▀ ١. ☜ **قەرەبو** ٢. چاقی ٣. نوعی خربُزە

**قەرەوێتە** / qerewîte/: ناو. بەندک؛ بۆینباخ؛ کەراوات؛ پارچەی باریک و درێژی دەور یەخەکراسی پیاوان ▀ کراوات

**قەرەوێتە** / qerewête/: ناو. کراوات؛ کەراوات؛ بۆینباخ؛ بەندک ▀ کراوات

**قەرەوێڵە** / qerewêłe/: ناو. قەروێڵە؛ تەختی لە سەر نووستن ▀ تختخواب

**قەرەهێڵ** / qerehêł/: ناو. گەردەلوول ▀ گردباد

**قەرەیەخە** / qereyexe/: ناو. کەسی ڕەشۆکی لە نێو هێزی چەکدار ▀ لباس‌شخصی

**قەرەیی** / qereyî/: ناو. ۱. جۆرێک کاڵەک ۲. ژیانی ڕەعیەتی بێجووت و گا 🇮🇷 ۱. نوعی خربزه ۲. زندگی خوش‌نشینی

**قەری** / qerî/: ناو. ئۆقرە؛ سەبر؛ ئارام 🇮🇷 شکیب؛ صبر

**قەرێ** / qerê/: ناو. قەرە؛ تاریکی 🇮🇷 تاریکی

**قەرێتە** / qerête/: ☜ **قەلاتە**

**قەرێز** / qerêz/: ناو. پەرژینی لە قوڕ و بەرد لە دەوری سەربان بۆ خەڵک پێوە دیار نەبوون 🇮🇷 دیوار کوتاه پیرامون بام

**قەرێژ** / qerêj/: ناوەڵناو. گەمار؛ چڵکن؛ پیس؛ پۆخڵ 🇮🇷 کثیف

**قەرێقەرێ** / qerêqerê/: ناو. ۱. ☜ **قەرەقەرە** ۲. وشەیەکە لە کایەی چاوشارکێدا دەگوترێ 🇮🇷 ۱. ☜ **قەرەقەرە** ۲. اصطلاحی در بازی قایم‌موشک

**قەرێنە** / qerêne/: ناو. کاری چەڵتووک لە دینگ دان بۆ دووهەم جار 🇮🇷 عمل دنگ زدن دوبارەی شالی

**قەڕابە** / qeřabe/: ناو. قوڕابە؛ دەفری گەورەی شەربەت و شەراب 🇮🇷 قرابه

**قەڕازە**[1] / qeřaze/: ناو. ۱. زنجیری شەست پێ بەستن «لە نێو کورد نەبێ دەسرازە نییە/ ئەو بەند و قفڵ و قەڕازە چییە؟! «هەژار، *بۆ کوردستان*»» ۲. زنجیری زۆر باریک بۆ جوانی 🇮🇷 ۱. زنجیر برای بستن ۲. زنجیر باریک زینتی

**قەڕازە**[2]: ناوەڵناو. قوڕازە: ۱. لەکارتە؛ کۆن و لەکارکەوتە ۲. تێکوپێک دراو 🇮🇷 ۱. قُراضه ۲. درب‌وداغان شده

**قەڕاسە** / qeřase/: ناو. گوریسی سەر بە ئاڵقە بۆ بار پێچان 🇮🇷 نوعی تناب باربند

**قەڕاش** / qeřaş/: ناو. ئاشەوان؛ ئاسیاوان 🇮🇷 آسیابان

**قەڕاڵ** / qeřał/: ناو. پاشا؛ پاڵشا 🇮🇷 پادشاه

**قەڕاڵیچە** / qeřałîçe/: ناو. شاژن؛ مەلەکە 🇮🇷 شهبانو

**قەڕان** / qeřan/: ناو. مەیدانی ئەسپ ڕادان بۆ ئەزموون 🇮🇷 میدان آزمایش اسبدوانی

**قەڕس** / qeřs/: ناو. تەز؛ سەرمایەک کە ئەندام سڕ دەکا 🇮🇷 سرمای کرخ کننده

**قەڕسان** / qeřsan/: چاوگ. قەسران؛ قەسرین؛ قەڕسین؛ قوتفین؛ قوفلین؛ قەسفین؛ قەفالتن؛ قەفلین؛ قەڕمتین؛ قەڕمین؛ قەیسەر بوون؛ تەزین لە سەرما؛ سڕ بوون لە سەرمان 🇮🇷 کرخت شدن از سرما

**قەڕساندن** / qeřsandin/: چاوگ. قەسراندن؛ لەش تەزاندنی سەرما 🇮🇷 کرخ کردن بدن به وسیله‌ی سرما

**قەڕسی** / qeřsî/: ☜ **قەڕم**

**قەڕسین** / qeřsîn/: ☜ **قەڕسان**

**قەڕم** / qeřm/: ناو. تەز؛ قەڕسی؛ سڕی لە سەرما 🇮🇷 کرخی ناشی از سرما

**قەڕمان** / qeřman/: چاوگ. ۱. ڕچان؛ ڕچیان ۲. تەزین؛ بێتاقەت بوون لە بەر سەرمای زۆر 🇮🇷 ۱. مُنجمد شدن ۲. کرخ شدن

**قەڕماندن** / qeřmandin/: چاوگ. ڕچاندن؛ بەستەڵەک دان 🇮🇷 یخبندان شدن

**قەڕمتی** / qeřm(i)tî/: ناوەڵناو. سڕبوو لە سەرمان؛ تەزیوی سەرما 🇮🇷 کرخیده از سرما

**قەڕمتین** / qeřm(i)tîn/: ☜ **قەڕسان**

**قەڕمین** / qeřmîn/: ☜ **قەڕسان**

**قەڕن** / qeřn/: ناو. چەرخ؛ سەدساڵ 🇮🇷 قرن

**قەڕناقوچ** / qeřnaqûç/: ناو. قەڕناقووچە؛ شەمشەمەکوێرە؛ شەوکۆرە؛ چەکچەکی 🇮🇷 شب‌پره؛ خُفاش

**قەڕناقوچە** / qeřnaqûçe/: ☜ **قەڕناقوچ**

**قەڕنیز** / qeřnîz/: ناو. قەرنێز؛ قرنیز؛ هێرە؛ سەرکەتیفە؛ کەتیفە: ۱. لەندێکی بچووک بە سەر

لێواری دیوار، درگا یان دەلاقەوە، پتر بۆ بەرگری لە داچۆڕانی باران ٢. ڕزنێکی باریک لە بەرد، کاشی یان مووزاییک بە پەڕانپەڕی لای خوارووی دیوارەوە بۆ جوانی و هەروەها بەرگری لە پیس بوون ≡ ١و٢. قرنیز

**قەڕنێز / qeřnêz/**: ☜ **قەڕنیز**

**قەرەتوورە / qeřetûre/**: ناسێ چووچک؛ نانەحاجیلەگلەگ؛ نانەحاجیلە؛ پەپکە ≡ پنیرک

**قەز / qez/**: ناو. ئاوریشمی خاو ≡ قز؛ ابریشم خام

⊡ **قەز ژەنتن**: ئاوریشمی خاو شی کردنەوە ≡ ابریشم خام را حلاجی کردن

**قەزا / qeza/**: ناو. ١. قەزا و قەدەر؛ قسمەت ‹داخۆ نەی سەر وەخت فەزای وەهاردا/ کام تەم نە سەر هەرد قەزا دیار دا «مەولەوی»› ٢. بەڵا؛ بەسەرهاتی ناخۆش ‹مەڵێن کەڵکی نەبوو، ڕۆیی جەهەننەم/ سەرم قەڵغانە بۆ تیری قەزاتان «نالی»› ٣. ڕەوتی فەوتان؛ فەوتیان؛ چوون ‹نوێژەکەم قەزا بوو› ≡ ١. قضا و قدر ٢. بلا ٣. قضا

▣ **قەزای حاجەت**: *[مەجاز]* دەس بەئاو ≡ قضای حاجت

⊡ **قەزا کردنەوە**: قەرەبوو کردنەوەی شتی فەوتاو ‹چونکە توحفە لازمە، هەرکەس لە غوربەت بێتەوە/ بەم دوو فەردە من قەزای سەد گۆنە توحفەم کردەوە «حاجی قادر»› ≡ جُبران مافات کردن

**قەزای کەسێ لە خۆ خستن**: بەلاگەردانی کەسێک بوون؛ داوای لادانی بەلا و ناخۆشی لە کەسێک کردن و هاتن بۆ خۆ ≡ درد و بلای کسی را به جان خریدن

**قەزای کەسێ لە کەسێ کەفتن**: لادانی بەلا و ناخۆشی لە کەسێک و چوون بۆ کەسی تر ≡ درد و بلای کسی به جان کسی افتادن

**بێ قەزا بوون**: بەلا لێ دوور بوون (ئەم سارستە کاتێ دەگوترێ کەسێکی بەڕێز یا خۆشەویست لە هەڵەدا بێ یان کارێکی نەگونجاوی کردبێ ‹ـ بێ قەزا بی، منت دەگەلم، شارەزام! «هەژار، چێشتی مجێور»› ≡ عبارت انتقادی مُحترمانە، در قالب دُعای خیر

**کەوتنە قەزا**: دوا کەوتن؛ بەجێ نەهێنانی کارێ کە دوایی دەبێ قەرەبووی بکەیتەوە ‹نوێژەکەم کەوتە قەزا› ≡ بە قضا افتادن

**قەزاتمە / qezatme/**: ناو. گۆشتاوی خەست و خۆڵ ≡ آبگوشت غلیظ

**قەزاتە / qezate/**: ناو. ڕۆژنامە ≡ روزنامە

**قەزاز / qezaz/**: ناو. ١. زەنگیانەهۆن؛ کەسێ کە وردەمووروو دەهۆنێتەوە ٢. هەوایەکی قام؛ ئاهەنگێکی گۆرانی ٣. ئاوریشمفرۆش ≡ ١. علاقەبند ٢. آهنگی است ٣. ابریشمفروش

**قەزاگر / qezagir/**: ناو. بەلاگەردان؛ سندووق؛ سەرگەرد ≡ بلاگردان

**قەزاگێڕەوە / qezagêřewe/**: ناو. قەزاوەگێڕ؛ بەلاگێڕ؛ بەلاگێڕەوە ≡ بلاگردان

**قەزان / qezan/**: ناو. قازان؛ بەرۆشی مس ≡ پاتیل مسین

**قەزانج / qezanc/**: ☜ **قازانج**

**قەزانچی / qezançî/**: ☜ **قازانچی**

**قەزاوبەڵا / qeza w beła/**: ناو. قەزا؛ بەڵا؛ بەسەرهاتی ناخۆش ≡ قضا و بلا

**قەزاوقەدەر / qeza w qeder/**: ناو. چارەنووسی خوایی ‹بێ قەزاوقەدەر، بێ تەقدیر حەق/ مەتاوۆ نەسیم بجمنۆ وەرەق «مەلا عەبدولڵای دشی»› ≡ قضا و قدر

**قەزاوەگێڕ / qezawegêř/**: ☜ **قەزاگێڕەوە**

**قەزبێن / qezbên/**: ناو. جۆرێ تیخی خەنجەر ≡ نوعی تیغ خنجر

**قەزخوان / qezx(i)wan/**: ☜ **قەزوان**

**قەزقوان / qezq(i)wan/:** ☜ **قەزوان**

**قەزقەوان / qezqewan/:** ☜ **قەزوان**

**قەزک / qezk/:** ناو. قەرەقاچ ☰ درختچەای است

**قەزکوان / qezk(i)wan/:** ☜ **قەزوان**

**قەزمە / qezme/:** ☜ **قولنگە**

**قەزوان / qezwan/:** ناو. قزبان؛ قەزخوان؛ قەزقوان؛ قەزقەوان؛ قەزکوان؛ قەسخوان؛ قەسقان؛ قسقەوان؛ قەسقەوان؛ قەسکان؛ قەسکوان؛ قەسوان؛ کەزان؛ کەزوان؛ کەسکان؛ وەن؛ وەنی؛ قەنی؛ وەنەتەق؛ بەری دارەوەن ☰ بَنه؛ چاتلانقوش؛ پستەی کوهی

**قەزوانسم / qezwansim/:** ناو. درەوشەی دەنکە قەزوان سمین بۆ تەزبیح ☰ درفش چاتلانقوش سُفتن

**قەزەب / qezeb/:** ناو. ١. کلۆش؛ لاسکی دەخڵ ٢. جەرگ؛ جگەر ☰ ١. ساقەی غله ٢. جگر

**قەزەمۆک / qezemok/:** ناوەڵناو. کورتەبالا؛ بستەبالا ☰ کوتوله

**قەزی / qezî/:** ناو. ١. قەزا؛ چۆرتم ٢. قسە؛ گوتە ☰ ١. بلا ٢. صحبت

⊡ **قەزی کردن:** قسە کردن ☰ گفتن

**قەژقەژک / qejqejik/:** ☜ **قشقەرە ـ١**

**قەژمەڕی / qejmerî/:** ☜ **قەشمەری**

**قەژە / qeje/:** ناو. قژ؛ توێژاڵکی سەر شتی ترشاو ☰ کفک مادەی تُرشیده

**قەژەکردگ / qejekirdig/:** ناوەڵناو. ترشاوی توێژاڵک بە سەر ☰ تُرشیدەی کفزده

**قەس / qes/:** ناو. ١. قەست؛ خەیاڵ لە کردنی کارێ ٢. هێڵنج؛ ڕەوتی دڵ بە یەکا هاتن ☰ ١. قصد ٢. تهوّع

⊞ **بە قەس کوژ:** بە قەس کوشت؛ بۆ کوشتن؛ بە نیازی مراندن ‹بە قەس کوژ لێیان دا› ☰ بە قصد کُشت

**بە قەس کوشت** ☜ **بە قەس کوژ**

⊡ **قەس کردن:** نیاز کردن؛ نیەت کردن ☰ قصد کردن

**قەساب / qesab/:** ناو. قەساو؛ قەسساب؛ قەسساو: ١. گۆشتفرۆش ٢. گوڕێن؛ سەربڕ؛ ئەسکەر؛ سەرژێکەر؛ گۆشتپاچ؛ کەسێ کە حێوان سەر دەبڕێ ☰ ١. قصّاب ٢. سلاخ

**قەسابخانە / qesabxane/:** ناو. قەساوخانە؛ کوشتارگا؛ شوێنێ کە مالاتی گۆشتی لێ سەر دەبڕن ☰ کُشتارگاه

**قەسابی / qesabî/:** ناو. قەساوی: ١. کاری قەساب ٢. فرۆشگای گۆشت ٣. کاری کوشت سەر بڕین بۆ فرۆشتن ٤. *[کنایە]* قەلاچۆ؛ کوشتوبڕ ☰ ١تا٣. قصابی ٤. قتل‌عام

**قەسار / qesar/:** ناو. قەسسار؛ گازر؛ کەسێ کە جلک و کووتاڵی خەڵک بە پارە دەشوا ☰ گازر؛ رختشو

**قەساس / qesas/:** ناو. قەساسە؛ تۆڵە؛ سزای هاوسەنگی تاوان (وەک ئەوەی کوژەر بکوژن و کوێرکەر کوێر کەن) ☰ قصاص

**قەساسە / qesase/:** ☜ **قەساس**

**قەساو / qesaw/:** ☜ **قەساب**

**قەساوخانە / qesawxane/:** ☜ **قەسابخانە**

**قەساوی / qesawî/:** ☜ **قەسابی**

**قەسپ[١] / qesp/:** ناو. کوردکوژە؛ جۆرێ خورمای هەرە خراپ ☰ نوعی خرمای نامرغوب

**قەسپ[٢]:** ناوەڵناو. سواو؛ ساویاو؛ سیویاگ ☰ ساییده

**قەسپەتو / qespetû/:** ناو. تووی سپی و درشت ☰ توت سفید درشت دانه

**قەست / qest/:** ناو. ١. مەبەست؛ مراز؛ سەرنج و بیری ئاگادارانە بۆ جێبەجێ کردنی کارێ ٢. چیرۆک؛ داستان؛ نەقڵ و نەزیلە ☰ ١. قصد ٢. قصه

⊡ **قەست کردن**: نیەت کردن 🇮🇷 قصد کردن

**قەستا کرن**: چیرۆک گوتن؛ داستان گێڕانەوە 🇮🇷 قصه گفتن

**قەستۆر** / qestor/: ناو. جۆرێ فاسۆنی بە کوڵکە 🇮🇷 فاستونی ماهوت

**قەستەسەر**[1] / qesteser/: ناو. خەتەر؛ بڤە 🇮🇷 خطر

**قەستەسەر**[2]: ناوەڵناو. زۆر سەخت و پێداگر (بۆ دژمن دەگوترێ) (... دەڵێ: تەیارە دوژمنی قەستەسەری خوریێە! هێندێکم خوری لە دیزەیەکدایە دەچم دەریدێنم! «هەژار، چێشتی مجێور») 🇮🇷 جانی (دشمن)

**قەستەقول** / qestequl/: ☜ قەرسەقول

**قەستەم** / qestem/: ☜ قەسەم

**قەستی** / qestî/: ناوەڵکار. ١. ژ دڵ؛ بەڕاست ٢. بە گاڵتە؛ نە ژ دڵ 🇮🇷 ١. عمدی ٢. به شوخی؛ نه جدی

**قەسخوان** / qesx(i)wan/: ☜ قەزوان

**قەسدانە** / qesdane/: ناوەڵکار. لە قەستی 🇮🇷 عمداً

**قەسر** / qesr/: ناو. ١. تەز؛ سڕی لە سەرمان ٢. قەسرە؛ خانووبەرەی زل و جوان 🇮🇷 ١. کرختی ٢. کاخ؛ قصر

**قەسران** / qesran/: ☜ قەڕسان

**قەسراندن** / qesrandin/: چاوگ. ١. شوشتنی جلک لە لای جلشۆری دووکاندار. ٢. ☜ قەڕساندن 🇮🇷 ١. شُستن لباس در مُغازەی لباسشویی ٢. ☜ قەڕساندن

**قەسرە** / qesre/: ☜ قەسر-٢

**قەسریک** / qesrîk/: ناو. گۆزەلە؛ دەفری میزی زارۆ کە لە ژێر بێشکە دادەنرێ 🇮🇷 لگن ادرار زیر گهوارەی کودک

**قەسرین** / qesrîn/: ☜ قەڕسان

**قەسساب** / qessab/: ☜ قەساب

**قەسسار** / qessar/: ☜ قەسار

**قەسسان** / qessan/: ☜ قوسسان

**قەسساو** / qessaw/: ☜ قەساب

**قەسف** / qesf/: ناو. ١. پاژ ـ پاژی گۆشت بۆ دابەشین و فرۆش ٢. تەز؛ سڕی؛ داهێزاوی ٣. بومباران؛ بومباباران 🇮🇷 ١. قطعه ـ قطعەهای گوشت برای توزیع و فروش ٢. کرختی ٣. بُمباران

⊡ **قەسف کردن**: بومباران کردن 🇮🇷 بُمباران کردن

**قەسفاندن** / qesfandin/: چاوگ. لەت ـ لەت کردنی کەلاکی حەیوان 🇮🇷 قطعه ـ قطعه کردن لاشەی حیوان

**قەسفین** / qesfîn/: ☜ قەڕسان

**قەسقان** / qesqan/: ☜ قەزوان

**قەسقەوان** / qesqewan/: ☜ قەزوان

**قەسکان** / qeskan/: ☜ قەزوان

**قەسکوان** / qesk(i)wan/: ☜ قەزوان

**قەسناخ** / qesnax/: ☜ قسناخ

**قەسناغ** / qesnağ/: ☜ قسناخ

**قەسناغە** / qesnağe/: ☜ قسناخ

**قەسنی** / qesnî/: ☜ قسنی[1]

**قەسوان** / qeswan/: ☜ قەزوان

**قەسە** / qese/: ☜ قسە

**قەسەبچە** / qesebçe/: ☜ قەسەبە

**قەسەبە** / qesebe/: ناو. قەسەبچە؛ شارۆکە 🇮🇷 شهرک

**قەسەتۆرە** / qesetore/: ناو. غەدارە؛ قەدارە 🇮🇷 قدّارە

**قەسەلی** / qeselî/: ناو. ڕەوتی لە سەرمان ڕەق بوون 🇮🇷 انجماد از سرما

**قەسەڵ** / qeseł/: ناو. ١. پاشاخوڕ؛ بەرماوی ئاژەڵ لە ئاخوڕدا ٢. پرزەی کلۆش دوای دروونەوە ٣. چەت و کای درشت 🇮🇷 ١. پساخور؛ پسمانده در آخور ٢. ساقەهای غله بعد از درو ٣. کاه درشت

**قەسەڵی** / qesełî/: ناو. جۆرێ تفەنگ 🇮🇷 نوعی تفنگ

**قەسەم** / qesem/: ناو. قەسـتەم؛ سـووند؛ سـوێند ‹خەراباتی دڵی نالی مەفـەرمووو خاڵـییە، نایـەم!/ بـە مەرگی تۆ قەسەم، چاوم! بە زیکرت بەیتی مـەعموورە «نالی»› 🇮🇷 سوگند؛ قسم

⊡ **قەسەم خواردن**: سوێند خـواردن 🇮🇷 سـوگند یـاد کردن؛ قسم خوردن

**قەسەم دان**: سوێند دان 🇮🇷 قسم دادن

**قەسەم کەفتن**: قەسەم وە درۆ دەرچوون 🇮🇷 قسم هرز رفتن

**قەسەمخۆر** / qesemxor/: ئاوەڵـناو. قەسـەمهـار؛ سوێندخۆر؛ بەڵێندار 🇮🇷 متعهد؛ قسم خورده

**قەسەمهار** / qesemhar/: ☜ **قەسەمخۆر**

**قەسیان** / qesyan/: چـاوگ. دڵ بەیـەکا هـاتن؛ هێڵنج دان 🇮🇷 دچار تهوع شدن

**قەسیدە** / qesîde/: ناو. قەسیە؛ چامە؛ بیچمـێ لـە شیعری عەرووزی بە زۆرتر لـە ٢٠ بـەیتی یـەک قافییەوە 🇮🇷 قصیده

**قەسیل** / qesîl/: ☜ **قەرسیل**

**قەسیلک** / qesîlik/: ناو. کار و ڕەوتی چاندنی تـۆم بۆ شەتڵ کردنەوە 🇮🇷 عمل بذر افشاندن برای نشا

**قەسیلە** / qesîle/: نـاو. جۆرێ کەوچکی داریـن 🇮🇷 نوعی قاشق چوبین

**قەسیو** / qesîw/: ناو. ڕەوتی ڕشانەوە؛ هێڵـنج دان 🇮🇷 قی؛ تهوع

**قەسیە** / qesye/: نـاو. ١. ☜ **قەسـە** ٢. ☜ **قەسیدە**

**قەش** / qeş/: ئاوەڵناو. ١. توێڵسپی (گا و کـەڵ) ٢. *[کنایە]* قۆشمە؛ شووم 🇮🇷 ١. پیشـانیسـفید (گـاو) ٢. نحس

**قەشا** / qeşa/: نـاو. قەشـەم؛ جەڵـغە؛ سەهۆڵـی ناسک 🇮🇷 یخ نازک

⊡ **قەشا گرتن**: بەستن؛ ڕچان 🇮🇷 یخ بستن

**قەشاخ** / qeşax/: ☜ **قاشاو**

**قەشارتن** / qeşartin/: چاوگ. پا کردن؛ تێخوڵ لێ کردنەوە 🇮🇷 پوست کندن

**قەشاغ** / qeşağ/: ☜ **قاشاو**

**قەشاڤ** / qeşav/: ناو. قەڵشی لێو 🇮🇷 ترک لب

**قەشان** / qeşan/: نـاو. ١. قەشـقە؛ کـەڵ و گـای قەش ٢. قەشانە؛ باڵندەیەکە لە تۆرەمەی مراوی، تیژباڵە و ڕەفتیشی باشە، نێو چاوانی زەردی کاڵ، لەشی بۆر و پاشەڵی ڕەشـە، نێرەکـەیان سـەری خەنەییە، زستانان زۆرن 🇮🇷 ١. گاو پیشانی سـفید ٢. گیلار

**قەشانە** / qeşane/: ☜ **قەشان ـ٢**

**قەشاو** / qeşaw/: ناو. ١. قـوڕاو بـە سەهۆڵـەوە ٢. ☜ **قاشاو** 🇮🇷 ١. گِل و یخ ٢. ☜ **قاشاو**

**قەشاوش** / qeşawiş/: ☜ **قاشاو**

**قەشاوی** / qeşawî/: نـاو. ١. تـوێژی ناسـکی سـەر هەویر ٢. پەترۆک؛ تـوێخی سـەر زام 🇮🇷 ١. قشر نازک روی خمیر ٢. کبرەی زخم

**قەشاویش** / qeşawîş/: ☜ **قاشاو**

**قەشپاندن** / qeşpandin/: چـاوگ. شـڕ کـردن و لەکەڵک خستن 🇮🇷 پارە کردن و از فایدە انداختن

**قەشـــــپای** / qeşpay/: ئاوەڵـــــــناو. دڕاوی لەکەڵـکـکـەوتوو؛ شـڕ و بـێکەڵـک 🇮🇷 پـارە و بیمصرف

**قەشتاندن** / qeştandin/: چاوگ. قەشتین: ١. تڕۆ کردن؛ بە سووکایەتی دەرکردن ‹بقەشـتە دژمـن، قادا مـە بـەردە/ ئـەو دەر وەلاتـێ گەرناسـێ کـوردە «جگـەرخوێن»› ٢. لە تێکـوڵ دەرهێنـانی گـوێز، بادام و ... ٣. لە قاپۆر جیا کردنەوەی جانـەوەری قاوغدار 🇮🇷 ١. بیرون کـردن ٢. درآوردن مغـز گـردو، بادام و ... ٣. درآوردن جانور صدفدار از صدفش

**قەشتی** / qeştî/: ئاوەڵناو. تڕۆکراو 🇮🇷 راندە شدە

**قەشتین** / qeştîn/: ☜ **قەشتاندن**

**قەشقوویل** / qeşqûyl/: ناو. قەشـقیل؛ قەشـقیلک:

١. تێخوڵەهێلکەی بەتاڵ ٢. هەنجیری وشکی خراب 🇮🇷 ١. پوست خالی تخم مرغ ٢. انجیر خُشک نامرغوب

**قەشقە**[١] / qeşqe/: ناو. ١. ئارەزوو ‹ڕەقیبی جوفتەلی، نابێتە نەخچیرت، کە خەرکوڕڕە/ ئەلیفی چایەرە دایم لە قەشقەی کەردڕ و جەودا «نالی»› ٢. کەتەوڵ؛ گیایەکە لە ناو گەنمدا شین دەبێ و گوڵی سپییە و دەنکەکەی وەک پێکوڵ وایە ٣. ☜ **قەشان ـ١** 🇮🇷 ١. آرزو ٢. گیاهی است ٣. ☜ **قەشان ـ١**

**قەشقە**[٢]: ناوەڵناو. ١. شووم؛ بەدفەڕ ٢. بەدبەخت؛ قەرەبەخت ٣. خۆنوێن 🇮🇷 ١. نحس ٢. بدبخت ٣. خودنما

**قەشقەل** / qeşqel/: ☜ **قشقەڕە ـ١**

**قەشقەلیک** / qeşqelîk/: ناو. تەلاشە/ تۆلاشەی دار 🇮🇷 تراشەی چوب

**قەشقیل** / qeşqîl/: ☜ **قەشقویل**

**قەشقیلک** / qeşqîlik/: ☜ **قەشقویل**

**قەشک** / qeşk/: ناو. گوڵێکە 🇮🇷 از گُل‌ها

**قەشم** / qeşm/: ناو. ڕەوتی قەڵشینی پێست لە سەرمان 🇮🇷 ترک پوست از سرما

**قەشمەر**[١] / qeşmer/: ناو. ١. گاڵتەجاڕ؛ جێگەی تیزێ‌کردنی خەڵک ٢. جۆرێ مەیموون 🇮🇷 ١. مسخره ٢. نوعی بوزینه

**قەشمەر**[٢]: ناوەڵناو. مووی پێشەسەر هەڵپاچڕاو 🇮🇷 موی پیشانی تراشیده

**قەشمەرە** / qeşmere/: ناو. بۆقژە؛ باڵندەیەکە لە تۆرەمەی ڕەشیشە، ڕەنگاوڕەنگ و دەنگ‌خۆش، لە داوێنی کوێستان دەژین 🇮🇷 طُرقه

**قەشمەری** / qeşmerî/: ناو. قەزمەری؛ کاری تیز کردن بە خەڵک ‹ئەمڕۆ لە کن زەمانە هونەر بۆتە قەشمەری/ شێری ژیانی بۆ چییە، مەیموونییە گەرەک «مەحوی»› 🇮🇷 سُخره

**قەشۆ** / qeşo/: ☜ **قاشاو**

**قەشە** / qeşe/: ناو. پیاوی ئایینی خاچپەرستان 🇮🇷 کشیش

**قەشەم** / qeşem/: ☜ **قەشا**

**قەشەماسی** / qeşemasî/: ☜ **قاشنە**

**قەشەن** / qeşen/: ☜ **قەشەنگ**

**قەشەنگ**[١] / qeşeng/: ناوەڵناو. قەشەن: ١. جوان؛ سپەهی ٢. چاک؛ خاس؛ باش 🇮🇷 ١. قشنگ ٢. خوب

**قەشەنگ**[٢]: ناوەڵکار. قەشەن؛ جوان؛ بە باشی ‹قەشەنگ بیچنە!› 🇮🇷 خوب؛ مُرتب

**قەشەنگی** / qeşengî/: ناو. قەشەنی؛ جوانی 🇮🇷 زیبایی

**قەشەو** / qeşew/: ☜ **قاشاو**

**قەشیتن** / qeşîtin/: چاوگ. تەرە بوون؛ چوونی بێ گەڕانەوە 🇮🇷 رفتن بی بازگشت

**قەف** / qef/: ناو. ١. جێگەی گوڵ لێ دەرهاتنی خەلە ٢. بەندی قامیش و حەیزەران ٣. چەم؛ خواری؛ چەماوی (بەتایبەت هی گۆچان) ‹باری خەمی تۆ بوو لە سەرم ئێستە کەوا من/ وەک چینی فەنەر وایە قەفی پشتی چەماوم «موفتی پێنجوێنی»› ٤. ئەشکەوت؛ شکەفت؛ نوا ٥. قەف؛ کۆخە؛ قۆزە ٦. سەوڵی کەڵەک لێ‌خوڕین ٧. ئاڵقەی بەن، گوریس، زنجیر و ... ‹هەڵبڕێ قەفی زنجیران/ چەک بداتە دەست یەخسیران «هێمن»› ٨. ئەندازەی دەورە و ئەستوورایی ٩. پەناگا؛ ئەنوا ١٠. گاشەبەردی زل لە چیا 🇮🇷 ١. جای سر زدن خوشەی غله ٢. بند نی و خیزران ٣. خم؛ قوس ٤. غار ٥. سُرفه ٦. پاروی قایقرانی ٧. حلقەی نخ، ریسمان، زنجیر و ... ٨. دور؛ مُحیط ٩. پناهگاه ١٠. صخره

▣ **قەف خواردن**: چەمان؛ چەمانەوە؛ داهاتن؛ نەوین ‹دڵ قەفی خوارد و شکا، کردییە نیشانەی قیرقاج/

گەردشی تیری نیگاهت لە قەفا میسلی قەجەر «سالم» ☰ خم شدن

**قەف کردن:** بەرز بوونەوەی بالای گەنم و جۆ و نزیک بوون لە گوڵ کردن ☰ قد کشیدن گندم و جو

**قەفا / qefa/:** ناو. ١. پشت؛ پاتک؛ پشتەمل؛ پشت ئەستۆ ‹بە قەفاوە بخەوە!› ٢. ئەشکەوت؛ مەغار ☰ ١. قفا ٢. غار

**قەفار / qefar/:** ناو. داری پشتیوانەی دەرگا ☰ چوب پشتوانەی در

**قەفاز / qefaz/:** ناو. بازی بڵند؛ کاری پەڕین بە باز ☰ پرش؛ جهش

**قەفازتن / qefaztin/:** چاوگ. پەڕین؛ بازی بڵند بردن ☰ پریدن؛ ورجهیدن

**قەفاڵ / qefal/:** ناوەڵناو. حولحولی؛ بێبار ☰ لاقید؛ بی بندوبار

**قەفالتن / qefaltin/:** چاوگ. ١. بەستن؛ ڕاوەستاندن ٢. ☜ **قەڕسان** ☰ ١. متوقف کردن ٢. ☜ **قەڕسان**

**قەفانجەرە / qefancere/:** ☜ **قەپانجەرە**

**قەفانچەلە / qefançele/:** ناو. ١. گرێی بەئالقە ٢. ئامرازێکی خەساندنی حەیوان ٣. ئالقەیەکی دارینە پەتی دە سەر بەستراوە، لێوی یەکسمی پێ دەپێچن تا نالی دەکەن ☰ ١. گره حلقەای ٢. از ابزار اخته کردن حیوان ٣. حلقەی چوبی دهان‌بند ستور، هنگام نعلبندی

**قەفاندن / qefandin/:** چاوگ. ١. سەوڵ لێدان ٢. پەنا دان ٣. پەنا نەدان ☰ ١. پارو زدن ٢. پناه دادن ٣. پناه ندادن

**قەفت / qeft/:** ناو. قەفتە: ١. دەسکەخەنجەر ٢. دەسکێ لە گوڵ و گیا ☰ ١. دستەی خنجر ٢. دستەای گُل یا گیاه

**قەفتە / qefte/:** ☜ **قەفت**

**قەفتیس / qeftîs/:** ناو. چاڵ و چۆڵ؛ کەندولەند ☰ چاله ـ چوله

**قەفچل / qefçil/:** ناو. ١. خڵتەی ناو سەبیل و دەمنەسگار ٢. لیکاوی دەم ٣. *[پلار]* قسەی بێشەرمانە ☰ ١. رسوب داخل چوب سیگاری و پیپ ٢. لعاب دهن ٣. حرف زشت

**قەفر / qefr/:** ناو. تەزی سەرما؛ سەرمای توند؛ سەرمای سەخت ☰ سرمای سخت

**قەفراخ / qefrax/:** ناوەڵناو. دووڕەنگ؛ دووڕوو؛ ناڕاست ☰ دورو؛ ریاکار

**قەفسینگ / qefsîng/:** ناو. دەفەی سینگ ☰ قفسەی سینه

**قەفش / qefş/:** ناو. ١. جێگەی کەملەوەڕ ٢. ڕەوتی لەوەڕانی کەم ☰ ١. چراگاه کم گیاه ٢. عمل چریدن اندک

**قەفقەفە / qefqefe/:** ناو. گیایەکە لە قەراغ چۆم دەڕوێ ☰ گیاهی است

**قەفل / qefl/:** ناو. ١. قولێک لە دروێنە ٢. قەفر؛ تەزی سەرما ☰ ١. بستەی درویده ٢. شدت سوز و سرما

**قەفلان / qeflan/:** چاوگ. تەزین لە سەرما ☰ کرخت شدن از سرما

**قەفلاندن / qeflandin/:** چاوگ. تەزاندن ☰ کرخت کردن از سرما

**قەفلک / qeflik/:** ناو. ملوانکە؛ گەردنبەند ☰ گردنبند

**قەفلە / qefle/:** ☜ **قافڵە**

**قەفلین / qeflîn/:** ☜ **قەڕسان**

**قەفوگوڵ / qef û guł/:** ناو. جەنگەی گوڵ دانی خەلە ☰ موسم گل دادن غله

**قەفۆک / qefok/:** ناو. لافاوی زۆر بەهێز و تەوژم ☰ سیل بسیار پرآب و قوی

**قەفەز / qefez/:** ☜ **قەفەس**

**قەفەزە / qefeze/:** ☜ **قەفەسە**

**قەفەس / qefes/:** ناو. قەفەز؛ بێرکم؛ ماڵی شووڵین بۆ باڵندە ☰ قفس

**قەفەسە / qefese/:** ناو. قەفەزە: ١. ئێسکی تەختی سنگ ٢. شتی چاوە ـ چاوە بۆ کتێب و کەل و پەل ٣. شباکی سەر قەبری پیاوچاکان ☰ ١. قفسەی سینە ٢. قفسەی کتاب و وسایل ٣. ضریح

**قەفەل / qefel/:** ناو. چۆلەمە؛ چەلەمە؛ قەلەمە ☰ جناغ

**قەفەنگێو / qefengêw/:** ناوەڵناو. بە سەر یەکدا کەلەکەکراو ☰ برهم انباشته

**قەفیژ / qefîj/:** ناو. [کۆن] پێوانەیەک بووە بۆ دەخل، قورسایی، ڕووبەر و ئاو، کە لە شوێن و دەورانی جۆراوجۆردا فەرقی کردووە ☰ قفیز

**قەڤد / qevd/:** ناو. قەبدە؛ قەفت؛ دەسکی شیر و خەنجەر ☰ دستەی خنجر؛ قبضە

**قەڤز[1] / qevz/:** ناو. بازی بەنهێم ☰ پرش

**قەڤز[2]:** ناوەڵناو. قەبز؛ وێستاو؛ ڕاوەستاو ☰ متوقف

**قەڤە / qeve/:** ☜ **قاوە**

**قەقبە / qeqbe/:** دەنگ. دەنگی کەو ‹ڕائەپەڕم بەر بەیان/ هەڵئەکێشم بۆ لووتکەی جوان/ ئەخوێنم ڕوو لە ئاسمان/ قەقبە قەقبە قەقبە قەق «گۆران»› ☰ صدای کبک

**قەقڵەبازی / qeqłebazî/:** ناو. شلێرە؛ گوڵەشلێرە ☰ لالەی واژگون

**قەقنوس / qeqnûs/:** ☜ **قەقنەس**

**قەقنە / qeqne/:** ☜ **قەقنەس**

⊡ **بونە قەقنە:** ☜ **بونە قەقنەس**

**قەقنەز / qeqnez/:** ☜ **قەقنەس**

**قەقنەس / qeqnes/:** ناو. قەقنە؛ قەقنەز؛ قەقنووس: ١. باڵدارێکی خەیاڵییە کە دەڵێن دوای هەزار ساڵ ئاگر دەگرێ و دەسووتێ و لە خۆڵەمێشەکەی قەقنەزێکیتر سەر هەڵدەدا ٢. [مەجاز] ڕەوتی سووتان بەتەواوی ‹دەستم لە کەبابەکە بەردا، بوو بە قەقنەس!› ☰ ١. ققنوس ٢. زُغالی؛ سیاه شده از سوختن

⊡ **بونە قەقنەس:** بوونە قەقنە؛ تەواو سووتان و فەوتان ‹بە ئۆغر کردنی من بوومە قەقنەس/ کە ئەو چوو بۆ سەفەر، من بۆ سەقەر چووم «مەحوی»› ☰ کاملاً سوختن

**قەقە / qeqe/:** ☜ **قاقە ـ٣**

**قەل[1] / qel/:** ناو. ١. ☜ **قالاو** ٢. بۆقلە؛ عەلەشیش؛ عەلۆعەلۆ ٣. قەفی قامیش ٤. سەرەتای جێگەی ڕاکردن لە کایەی تۆپە ڕاکردێندا ☰ ١. ☜ **قالاو** ٢. بوقلمون ٣. بند نی ۴. مرز دویدن در بازی

**قەل[2]:** ناوەڵناو. ١. یەکچاو ٢. یەک گوێ (بۆ ئاژەل) ٣. بەزمان؛ قسەزان ٤. قەرت؛ لە بنەوە بڕاو ☰ ١. یک چشم ٢. یک گوش ٣. سُخنور ۴. از بیخ بُریده

⊡ **قەل کردن:** هەڵپاچین؛ بە قەیچی بڕین ☰ قیچی‌بُر کردن

**قەلاچ / qelaç/:** ناو. ١. قەراج؛ شوێنی بلند لە دەشت و زەوی کە شیناهی لێ شین نابێ ‹زارۆک ل سەرێ قەلاچ ل دۆ بەرانان دگەرن› ٢. قولانج؛ گوێل؛ درێژایی نێوان قامکی زل و قامکی شادە بە ئاواڵەیی ٣. باڵ؛ درێژایی نێوان هەر دوو دەستی وەکری ☰ ١. زمین مرتفع بایر ٢. باژ؛ طول میان شست و سبابە ٣. طول هر دو دست و بازوی باز

**قەلاچا / qelaça/:** ناو. ئێشکی شەوانە ☰ کشیک شبانە

**قەلاس / qelas/:** ناو. قەلتاس؛ گیایەکی یەکساڵەی کورتەبالایە گوڵی چەن پەڕی نووک تیژ دەکا و نووسەکە ☰ گیاهی است

**قەلاسیلکە / qelasîlke/:** ☜ **قالاو**

**قەلاش / qelaş/:** ناوەڵناو. ١. دلاوا؛ دڵفرەوان ٢. [پلار] سووک و بێکارە ‹دائیم لە دەرێ وی قاپۆچی

بـووا/ قـەللاع و قـەلاش و قـاوەچی بـوو «ئەحمـەد خانی» ☰ ١. سخاوتمند ٢. ولگرد و هرزه

**قەلاشتن / qelaştin/**: ☜ **قەڵشاندن**

**قەلان**[1] **/ qelan/**: چاوگ. ١. درویـن لـە دەشـتدا (گیـا و ...) ٢. داهاتنـەوە؛ دانەوینـەوە (وەک: لـە یاری حەمزەل/کەوشـەکدا) ٣. سـوور بوونـەوە (لـە رۆندا) ٤. قـاڵ بـوون (رۆن و ...) ٥. کـولان (لـە ئاودا) ٦. لە جێ هەڵکەنران و جوولانەوەی شـتی قورس ☰ ١. چیدن در صحرا (گیاه و...) ٢. خم شـدن ٣. سُرخ شـدن (در روغـن) ٤. گُـداختن (در روغـن) ۵. جوشیدن (در آب) ۶. جُنبیدن جسم سنگین

**قەلان**[2]: نـاو. ١. مۆڵـەتی دووبـارە لـە کایـەدا ٢. بەرۆک؛ یەخە؛ بەروا؛ ئەو بەشە لە جل کـە سـەر سینگ و دەوری مل دەگـرێ ‹سـەری دە قـەلان خستووە!› ☰ ١. آوانـس؛ مُهلـت دوبـاره در بـازی ٢. جَیب؛ گریبان

☐ **قەلان کردن:** داهاتنەوە لە یـاری کەوشـەکدا ☰ خم شدن در نوعی بازی پرشی

**قەلانجە / qelance/**: ☜ **قشقەرە ـ١**

**قەلانچە / qelançe/**: ☜ **قشقەرە ـ١**

**قەلاندن / qelandin/**: چاوگ. ١. سـوور کردنـەوە (لە رۆندا) ٢. قاڵ کـردن (رۆن و ...) ٣. کولانـدن (لە ئاودا) ٤. لە جێ هەڵکەندن و جووڵاندنـەوەی شتی قورس ٥. برژاندن (بەتایبەت گۆشت) ٦. داخ (زۆر گەرم) کردن ‹فـێ تافـێ ئـەم قەلانـدن› ☰ ١. سُـرخ کـردن (در روغـن) ٢. گـداختن (روغـن و ...) ٣. جوشاندن (در آب) ۴. جُنباندن جسم سنگین ۵. برشـته کردن (بویژه گوشت) ۶. داغ (بسیار گرم) کردن

**قەلاندوش / qelandûş/**: ☜ **قەڵاندۆش**

**قەلاوز / qelawiz/**: ناو. شارەزا؛ بەڵەد؛ رێشاندەر ☰ راهنما

**قەلاووز / qelawuz/**: نـاو. داهـۆڵ؛ چـاتۆڵ ☰ مترسک

**قەلب / qelb/**: ناو. دڵ ☰ قلب

☐ **قەلب کەسێ ساق بوون:** سلامەت و بێوەی بوون ☰ تن کسی سالم بودن

**قەلبساقی / qelbsaqî/**: ناو. سـلامەت؛ سـاغی ☰ سلامت

**قەلبیر / qelbîr/**: نـاو. ١. کەمـە؛ بێژنـگ ٢. ☜ **قەلبیرە** ☰ ١. غربال ٢. ☜ **قەلبیرە**

**قەلبیرە / qelbîre/**: ناو. قڕ؛ قەلبیر؛ کـاری سـووڕ دانی لـەش بـۆ سـەرنج ڕاکێشـان بەتایبـەت لـە سەمادا ☰ قِر

**قەلپ / qelp/**: ناو. قاپڵۆخ ‹قەلپی هێکێ› ☰ پوسته

**قەلپوت / qelpût/**: نـاو. قلاپیک؛ قەلپووچ؛ چـاوێ کە گلێنەی دەرهاتبێ ☰ حدقەی خـالی از کُـرەی چشم

**قەلپوچ / qelpûç/**: ☜ **قەڵپوت**

**قەلتاس / qeltas/**: ☜ **قەلاس**

**قەلتە / qelte/**: ☜ **قلیان ـ١**

**قەلـراو / qelraw/**: نـاو. قـەلراوی؛ ماسـیخۆرە؛ ماسیگرە؛ ماسیەوچنە ☰ قاق؛ مُرغ ماهیخوار

**قەلراوی / qelrawî/**: ☜ **قەلراو**

**قەلزان / qelzan/**: چاوگ. قـەلزین؛ بـە خشـکە و ماتە ـ ماتە بۆ شتێک چوون ☰ پاورچین ـ پاورچین رفتن

**قەلزاندن / qelzandin/**: چاوگ. بە خشکە و ماتـە بۆ شتێک ناردن ☰ پاورچین ـ پاورچین فرستادن

**قەلزین / qelzîn/**: ☜ **قەلزان**

**قەلع / qel'/**: ناو. زریـچ؛ ژریـژ؛ ژرێـژ؛ ژێرێـژ؛ مـز؛ قەلایی؛ قالایی؛ قەلای؛ قەلا؛ کـەلناس؛ تـوخمی کیمیـایی کـانزایی، بـە ژمـارەی ئـەتومی ٥٠ و کێشـی ئـەتومی ١١٨,٦٩، سـپی مەیلـەو شـین، بریقەدار، نەرم و چەکوشخۆر، کە بـۆ چـێ کـرنی تەنەکە و ئالیاژیتر بە کار دێ ☰ قلع

**قەلغان / qelğan/**: ☜ **قەڵخان**

**قەڵفڕ / qelfiř**/: ناو. قالاوفڕ: ١. بازییەکە بۆ زارۆکان دەکرێ ٢. /کینایە/ کار و ڕەوتی هەڵاتن؛ ڕاکردن ‹بەزمی هوزارە، قەلفڕی ئەغیارە، دەوری گوڵ/ سۆفی بڕۆ! مەبە بە درک! تۆ لە ئێمە نی «نالی»› ✉ ١. کلاغپر ٢. فرار

◘ **قەڵفڕ کردن**: /کینایە/ ١. ڕاکردن؛ هەڵاتن ٢. ئاوارە بوون ✉ ١. فرار کردن ٢. آوارە شدن

**قەڵفە / qelfe**/: ناو. دەستە؛ کۆمەڵ ✉ دستە؛ گروە

**قەڵفەز / qelfez**/: ☜ قەڵبەزە

**قەڵقانـدن / qelqandin**/: چاوگ. وە لەقەڵەق خستن؛ بەملا و بەولادا ڕاژاندن ✉ بە هر طرف حرکت دادن و جُنباندن

**قەڵقشک / qelqişik**/: ☜ قشقەرە ـ١

**قەڵقوڵـە / qelqûle**/: ناو. شەمشێرە؛ ئاچەری دارینی درگا لە پشتەوە داخستن ✉ کلید قُفل چوبین

**قەڵقەڵـە / qelqele**/: ناو. ١. پێسیری کراس ٢. پێسیری کفنی مردوو ✉ ١. یقەی پیراهن ٢. یقەی کفن

**قەڵقیشک / qelqîşik**/: ☜ قشقەرە ـ١

**قـەڵلاش / qellaş**/: ناوەڵناو. هەڵەخەرج؛ ئەبلەخەرج؛ دەسبلاو ✉ ولخرج

**قەڵلە / qelle**/: ناو. فێڵ؛ حیلە ✉ حیلە

**قەڵمراو / qelm(i)raw**/: ☜ قەلمراوی

**قەڵمراوی / qelm(i)rawî**/: ناو. قەلمراو؛ تۆرەمە باڵندەیەکی ڕەشی ماسیگرن، دوو جۆری بچووک و گەورەیان هەیە ✉ باکلان

**قەڵن / qelin**/: ☜ قلیان ـ١

**قەڵنە / qelne**/: ☜ قلیان ـ١

**قـەڵ و بـەرد / qel û berd**/: ناو. /کینایە/ ئاگر و پووش؛ دوو دژمنی وا کە یەکیان لە حاند ئەوی تر، خۆی پێ ڕاگیر نابێ ‹هەر دەرکەوت، وەک قەل و بەرد هەموو هەڵاتن› ✉ کارد و پنیر

**قەڵوخەدەنـوک / qeluxedenûk**/: ناو. لووتپان؛ جۆرێک مراوی دەندووک پانە بە درێژایی ٥٠ سانتیمیتر، نێرە پشتی ڕەش و خاڵخاڵ، سەری شین، تەنیشت و بەر زگی خەنەیی و سینگی سپییە، مێ لە بۆرەسۆنە دەچێ و تەنیا سەرشانی شینە، لە بەنداو و زەلکاواندا دەژین ✉ نُکپهن

**قەڵودەڵ / qel û del**/: ناو. /کینایە/ ١. زمانلووسی؛ زمانتەڕی ٢. فێڵبازی؛ گزیکاری ✉ ١. چربزبانی ٢. حُقّەبازی

**قەڵوە / qelwe**/: ناو. کەڵوە؛ ددانی درۆکی دڕندە ‹قەلوەی بەراز› ✉ دندان نیش درندە

**قەڵوەز / qelwez**/: ☜ قەڵبەزە

**قەڵۆکە / qeloke**/: ناو. گیایەکە لە پۆلکە دەکا و دەخورێ ✉ گیاهی است

**قەڵو / qelû**/: ☜ قلیان ـ١

**قەڵوخ / qelûx**/: ناو. کەوچێز؛ کشتێل؛ کوندەز؛ کەپچە ✉ ملاقە

**قەڵوخـە / qelûxe**/: ناو. ١. ئەسکوێ؛ کەپچە؛ کەوچێز ٢. جۆرێ مراوی دەندووکپان ✉ ١. ملاقە ٢. نوعی مُرغابی

**قەڵوخەدەنـوک / qelûxedenûk**/: ناو. غەلوخەدەنووک؛ مراوی لووتپان ✉ اُردک نوکپهن

**قەڵـوز / qelûz**/: ناوەڵناو. پشتکۆم؛ کووڕ ✉ کوژپشت

**قەڵوکە / qelûke**/: ناو. فاسۆلیا؛ لۆبیا؛ ماشەسوورە ✉ لوبیا

**قەڵون / qelûn**/: ☜ قلیان

**قەلە / qele**/: ناو. گیایەکە ✉ گیاهی است

**قەلەباچکە / qelebaçke**/: ☜ قشقەرە ـ١

**قەلەبازەڵە / qelebazeļe**/: ☜ قشقەرە ـ١

**قەلەبانەیی / qelebaneyî**/: ☜ قشقەرە ـ١

**قەلـەپڕ / qelepiř**/: ناو. قەلەفڕ؛ ژەکێ کە دە ناو

لوولەقامیشدا گەرم کرابێ ⇐ خوراکی از آغوز

**قەلەپۆپە** / qelepope/: ناو. ترۆپکی کێو؛ دوندی چیا ⇐ قُلەی کوه

**قەلەپیسک** / qelepîs(i)k/: ناو. شەن؛ شەنە ⇐ افشون

**قەلەتورک** / qeletûrik/: ناو. لاسکەگیای هلۆل ⇐ ساقەی گیاه کاوک

**قەلەخ** / qelex/: ناو. قلخ؛ برنگ؛ برینگ ⇐ دوکارد؛ قیچی پشم‌چینی

**قەلەخان** / qelexan/: ناو. گیایەکی بەدڕکە ⇐ خاربُنی است

**قەلەخەرمان** / qelexerman/: ☜ قەرەخەرمان

**قەلەڕەش** / qeleřeş/: ناو. قاژ؛ قاژدەرە؛ قاش؛ قاقژ؛ قژۆلە؛ قاقیشک؛ قیژ؛ قاژوو؛ قاژی؛ کۆربەلا؛ قاژەسیاوێ؛ قالاخ؛ قژکاڕەش؛ قژیاک؛ قەلەڕەشکە؛ قەلەڕەشە؛ قالاوەڕەشە؛ کەلەڕەش؛ سیاوقەلاو؛ قەلاوە سیاوە؛ قرک؛ قراک؛ کۆربەلا؛ باڵندەیەکی گەورەیە لە ناو تیرەی قالاواندا، نزیک ٤٥ سانتی‌میتر دەبێ، هەموو شتێک دەخوا، هەموو گیانی ڕەشە و پەڕەکانی بریقەدارن، فڕینی ڕاست و بە قەوەتە و یەکجار تەمەن‌درێژە. جووت‌ـجووت دەژین و هێلانەی گەورە دروست دەکەن ⇐ کلاغ سیاه

**قەلەڕەشکە** / qeleřeşke/: ☜ قەلەڕەش

**قەلەڕەشە** / qeleřeşe/: ☜ قەلەڕەش

**قەلەژارە** / qelejare/: ☜ قشقەڕە ـ١

**قەلەژاژە** / qelejaje/: ☜ قشقەڕە ـ١

**قەلەژاڵە** / qelejałe/: ☜ قشقەڕە ـ١

**قەلەسابوونە** / qelesabûne/: ☜ قەلەسابوونی

**قەلەسابوونی** / qelesabûnî/: ناو. قەلەسابوونە؛ قالاوی باڵڕەشی لەش خۆڵەکەوەیی ⇐ کلاغ سیاه و خاکستری

**قەلەسوو** / qelesû/: ☜ قالتاق[1]

**قەلەشین** / qeleşîn/: ناو. باڵداریکە بە قەی قەلێک دەبێ و ڕەنگی کەوەیە ⇐ پرندەای شبیه کلاغ

**قەلەفر** / qelefir/: ناو. کەڕە؛ قەلەپڕ؛ فرۆیەک کە لە قەفەقامیشدا گەرم دەکرێ ⇐ نوعی آغوز پختە

**قەلەفڕ** / qelefiř/: ☜ قەلەپڕ

**قەلەفسک** / qelefisk/: ناو. تووتەکان؛ جینچک؛ ڕەوتی ترووشکان ⇐ چُمباتمە

**قەلەفیسک** / qelefîsk/: ناو. دون؛ چینچک؛ چنچک؛ تووتەک ⇐ چُمباتمە

**قەلەقندا** / qeleqinda/: ناو. خەلاتی گەورەپیاوان بۆ ژێردەستان ⇐ خلعت

**قەلەکووچک** / qelekûçik/: ناو. قامکەتووتە؛ خەرتەلە ⇐ انگشت کوچکە

**قەلەگورگ** / qelegurg/: ناو. گەورەترین باڵندەی تۆرەمەی قەل، نزیک ٦٥ سانتی‌میتر دەبێ، دندووکی ڕەش و ئەستوور و گەورە، تووکی بەرچێڵەی قرژ، پەڕ و باڵی ڕەش و دەنگی بۆڕە؛ کاتی هێلکە هاتن لە هەودا تەقڵە لێ دەدا، لە سەر دار و ڕەوەزی بە سەر ئاودا دەبینرێ ⇐ غُراب

**قەلەمردارە** / qelemirdare/: ناو. قەلەمرداری؛ قەلەمندار: ١. سەرەتای شوێنی ڕاکردن لە یاری تۆپە ڕاکردێندا ٢. /کنایە/ ژوانگە؛ جێ‌ژوان ⇐ ١. سرِ میدان دو در توپ بازی ٢. میعادگاه

**قەلەمرداری** / qelemirdarê/: ☜ قەلەمردارە

**قەلەمندار** / qelemindar/: ☜ قەلەمردارە

**قەلەموون** / qelemûn/: ناو. قەلەموونە؛ قەل؛ عەلەشیش؛ بۆقلە؛ بەقلەمووت ⇐ بوقلمون

**قەلەموونە** / qelemûne/: ☜ قەلەموون

**قەلەن** / qelen/: ☜ قالان

**قەلەند** / qelend/: ☜ قالان

**قەلەندۆر** / qelendor/: ناو. دۆریە؛ گندۆر؛ گیایەکە ⇐ گیاهی است

**قەڵەندوور / qelendûr**/: ناو. گوندوور؛ گتوڕ؛ گوندۆڕ؛ گونۆڕ؛ دۆریە ☰ گیاهی است

**قەڵەندەر / qelender**/: ناوەڵناو. سەرپەتی؛ چەکەسۆ؛ گوێنەدەر بە دنیا و داب و دەستووری دنیا ☰ قلندر

**قەڵهان / qelhan**/: ☜ قەڵهین

**قەڵهاندن / qelhandin**/: چاوگ. لە ناو بردن؛ هیچ بۆ نەهێشتن ☰ از بین بردن؛ قلع و قمع کردن

**قەڵهین / qelhîn**/: چاوگ. قەڵهان؛ لە ناو چوون؛ شۆنەوار نەمان ☰ از بین رفتن؛ قلع و قمع شدن

**قەڵی[1] / qelî**/: ناو. قەڵیە؛ قاورمە ☰ قورمە

**قەڵی[2]**: ناو. قەڵیە؛ سوورەوەکراو ☰ سُرخ‌شدە

**قەڵیان / qelyan**/: ☜ کوولان

**قەڵیپیڤاز / qelîpîvaz**/: ناو. گۆشتی سوورەوەکراو بە پیاز و تەماتەوە ☰ گوشت سُرخ شدە با پیاز و گوجەفرنگی

**قەڵیڕ / qelîr**/: ناوەڵناو. قلێر؛ چلکن؛ پیس؛ پۆخڵ ☰ چرکین؛ کثیف

**قەڵیسێڵ / qelîsêł**/: ناو. بەربەسێڵ؛ قوڕاو؛ چێشتی ماست و گۆشت ☰ غذای ماست و گوشت

**قەڵین[1] / qelîn**/: چاوگ. ۱. جۆشین لە سەر ئاگر ۲. حەلین؛ توانەوە لە گەرمان ۳. لە ناو چوون؛ قڕ بوون ☰ ۱. جوشیدن بر آتش ۲. گُداختن ۳. قلع‌وقمع شدن

**قەڵین[2]**: ☜ قلیان-۱

**قەڵینۆک / qelînok**/: ناو. برێشکە؛ دانەوێڵەی بۆدراو لە سەر ساج ☰ دانەی بودادەی غلّە

**قەڵینەک / qelînek**/: ناو. تاوە؛ ماوڕێژ؛ ناوسنگانە ☰ تابە

**قەڵێر / qelêr**/: ناوەڵناو. پیس؛ گلاو؛ چەپەڵ؛ پۆخڵ ☰ چرکین

**قەڵ / qeł**/: ناو. قەو؛ کەمبەر؛ جێگەی پشتێند ☰ کمر

**قەڵا / qeła**/: ناو. ۱. خانووی بنکەی چەکداران لە سەر کێو ۲. ماڵی خان و ئاغا ۳. گرتووخانە؛ زیندان ٤. گەڕاندنەوەی فەوتاو ٥. قالاو ٦. ☜ قەڵایی ☰ ۱. قلعە ۲. خانەی ارباب ۳. زندان ۴. جبران مافات ۵. کلاغ ۶. ☜ قالایی

⊡ **قەڵا کردن**: لە سەر یەک دانان ☰ بر هم انباشتن

**قەڵا کردنەوە**: قەرەوی کردنەوە ☰ جبران مافات کردن

**قەڵاپرچن / qełapirçin**/: ☜ قەڵاپەچن

**قەڵاپەچن / qełapeçin**/: ناوەڵناو. قەلاچن؛ قەلاپرچن؛ قەلاقووچان؛ قەلانقووچ؛ قەلانقووچە: ۱. لە سەر یەک داندراوی بڵند ۲. پڕاوپڕ؛ لیپ ☰ ۱. بر هم انباشتە ۲. مالامال

⊡ **قەڵاپەچن بوون**: بە سەر یەکدا کۆمەڵ بوون و بەرز بوونەوە. هەروەها: **قەڵاپەچن کردن** ☰ بر هم تلنبار شدن

**قەڵات / qełat**/: ناو. قەرات؛ قەلا؛ ماڵی میر لە سەر کێو ☰ کلات

**قەڵاتە[1] / qełate**/: ناو. قەراتە؛ قەرێتە: ۱. قەلادە؛ کالان ۲. تایە؛ گیشە؛ کۆمای گەنم و نۆک و جۆ دوای دوورینەوە ☰ ۱. قلادە ۲. تودەی غلەی دروشدە

**قەڵاتە[2]**: ناوەڵناو. قەراتە؛ قەرێتە؛ بە سەر یەکا کەڵەکەکراو ☰ بر هم انباشتە

**قەڵاچن / qełaçin**/: ☜ قەڵاپەچن

**قەڵاچۆ / qełaço**/: ناو. قەراچۆ؛ قەلاچوو؛ قەڵتوبڕ؛ کارەڕەهاتی کوشتن و تەفر و توونا کردن ☰ قلع و قمع

⊡ **قەڵاچۆ تێکەوتن**: قڕ بوون؛ قڕان تێکەوتن ☰ مُنقرض شدن

**قەڵاچۆ کردن**: قڕان تێ خستن ☰ قلع و قمع کردن

**قەڵاچوو / qełaçû**/: ☜ قەڵاچۆ

**قەڵاچە** / qełaçe/: ناو. قەڵای بچووک ‹پشت و کۆمەکت؟ عیلم و زانینە/ قەلا و قەلاچەت؟ سیدق و یەقینە «قانع»› ☰ قلعەی کوچک

**قەڵاچی** / qełaçî/: ناو. ١. ئاگاداری قەڵا ٢. قاپ و مس سپی‌کەرەوە ☰ ١. دژدار ٢. رویگر

**قەڵاخ** / qełax/: ☜ قالاغ

**قەڵاخدان** / qełaxdan/: ☜ قالاغدان

**قەڵاخی** / qełaxî/: ☜ قالاخی

**قەڵاخی‌پۆش** / qełaxîpoş/: ☜ قالاخی‌پۆش

**قەڵادار** / qeładar/: ناو. دژوان؛ دژبان ☰ دژبان

**قەڵادوشان** / qeładuşan/: ☜ قەڵاندۆش

**قەڵادۆش** / qeładoş/: ☜ قەڵاندۆش

**قەڵادۆشە** / qeładoşe/: ☜ قەڵاندۆش

**قەڵادووشان** / qeładûşan/: ☜ قەڵاندۆش

**قەڵادە** / qełade/: ☜ قلادە

**قەڵاڕێژ** / qełařêj/: ناو. کاری جۆش دانی کون یا دەرگای دەفری کانزا بە قەڵایی ☰ جوشکاری سوراخ یا درِ ظرفِ فلزی

**قەڵاس** / qełas/: ناو. ١. داسووکە؛ داسوولکە؛ بژانگ؛ پرزەی گوڵی گەنم و جۆ ٢. گیایەکە ☰ ١. اخگل؛ داسه ٢. گیاهی است

**قەڵاسێلکە** / qełasêlke/: ☜ قالاو

**قەڵاش** / qełaş/: ☜ قەڵشت

**قەڵاشتن** / qełaştin/: ☜ قەڵشاندن

**قەڵاشتوو** / qełaştû/: ☜ قەڵشاو

**قەڵاشدن** / qełaşdin/: ☜ قەڵشاندن

**قەڵاشران** / qełaşran/: ☜ قەڵشان

**قەڵاشکەری** / qełaşkerî/: ☜ قلاشکەری

**قەڵاشکێن** / qełaş(i)kên/: ناو. قەڵاگر؛ تۆپی لوولەدرێژی دوورپێک ☰ توپ دورزن

**قەڵاغ** / qełağ/: ناو. شوێنی هەمار کردنی تەپاڵە ☰ تاپالەدان

⊡ **قەڵاغ دان**: سواخ دانی قەڵاغ بە شیاکەی ئاژەڵ ☰ اندود کردن تاپالەدان با سرگین گاو

**قەڵاغدان** / qełağdan/: ناو. دەوەڵان؛ کۆشک؛ عەماری تەپاڵە ☰ انبار تاپالە

**قەڵاغەتەپاڵە** / qełağetapałe/: ناو. ئاخڵە؛ دیواری لە تەپاڵە ☰ دیوارتاپالە

**قەڵافەت** / qełafet/: ناو. قیافە؛ قەواژ؛ کەلافەت: ١. سەروسیما ٢. بەژن و باڵا ☰ ١. ریخت؛ قیافە ٢. قد و بالا

**قەڵاقوچ** / qełaqûç/: ☜ قەڵاقوچکە

**قەڵاقوچان** / qełaqûçan/: ☜ قەڵاپەچن

**قەڵاقوچکە**[1] / qełaqûçke/: ناو. قەلاقووچە؛ قەلاقووچ؛ گوێزەفەریکە؛ کاکڵەگوێزی بە ساخی دەرهاتوو ☰مغز گردوی دُرُسته

**قەڵاقوچکە**[2]: ئاوەڵناو. قەلاقووچە؛ قەلاقووچ؛ بە سەر یەکا کۆما کراو ☰ بر هم انباشته

**قەڵاقوچە** / qełaqûçe/: ☜ قەڵاقوچکە

**قەڵاقەڵا**[1] / qełaqeła/: ناو. قەرێقەرێ؛ وشەیەکە لە بازی چاوشارکێدا ☰ اصطلاحی در قایم‌موشک‌بازی

**قەڵاقەڵا**[2]: ئاوەڵناو. ١. بە سەر یەکا کراوی بڵندەوەبوو ٢. دە ناو یەکتردا (زیندان) ☰ ١. تودەی بر هم انباشته ٢. تودرتو (زندان)

**قەڵاگ** / qełag/: ناو. قەلاگە؛ قەلانگ؛ قەڵەنگ؛ ئاسن و داری سەرخوار بۆ میوە چنین و شتی لە چاڵ‌کەوتوو دەرهێنان ☰ چنگک

**قەڵاگا** / qełaga/: ناو. قەلاگە: ١. جێ و شوێنی قەلا ‹بچمە لانی بەچکەشێران/ قەلاگای تەنگانەی مێران «هێمن»› ٢. دژ؛ قەلا ☰ ١. جایگاه قلعه ٢. قلعه

**قەڵاگر**[1] / qełagir/: ☜ قەڵاشکێن

**قەڵاگر**[2]: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* شەڕڤان؛ ئازا لە شەڕ ☰ جنگاور

**قەڵاگە** / qełage/: ناو. ١. ☜ قەڵاگ ٢. ☜

قەلاگا

**قەلاّن / qełan/:** ☜ قەڵغان ـ١

**قەلاّندن / qełandin/:** چاوگ. ١. کاول/ وێران کردن ٢. کولاندن؛ کولانن ☰ ١. ویران کردن ٢. جوشاندن

**قەلاّندۆش / qełandoş/:** ناو. قەلاندووش؛ قەلادۆش؛ قەلادۆشە؛ قەلاندۆشکان؛ قلانیشۆ؛ قەلادوشان؛ قەلادووشان؛ سواری سەرشانی کەسێک ☰ قلمدوش

**قەلاّندۆشکان / qełandoşkan/:** ☜ قەلاّندۆش

**قەلاّنشین / qełan(i)şîn/:** ئاوەڵناو. هەساری ☰ قلعەنشین

**قەلاّنقوچکە / qełanquçke/:** ناو. قەلاووچ؛ قەلانقووچ؛ کاری بە سەر یەکدا کردن تا بڵند دەبێ ☰ تلنبار

**قەلاّنقوچ[1] / qełanqûç/:** ناو. ١. کار و ڕەوتی لە سەر سەر و دەست وێستان ٢. کاری بە سەر یەکدا کردن تا بڵند بوون ☰ ١. عمل ایستادن روی سر و دست ٢. انباشت

**قەلاّنقوچ[2]:** ☜ قەلاّپەچن

**قەلاّنقوچە / qełanqûçe/:** ☜ قەلاّپەچن

**قەلاّنگ / qełang/:** ☜ قەلاّگ

**قەلاّو / qeław/:** ☜ قالاو

**قەلاّوان / qeławan/:** ناو. دژدار؛ دزدار ☰ قلعەبان

**قەلاّوێز / qeławêz/:** ناو. ١. سەردەلیل؛ پێشەنگ ٢. پێچەکرەی لوولە، سەرپێچ و ... ☰ ١. پیشاهنگ ٢. قلاویز

⊡ **قەلاّوێز کردن:** دروست کردنی پێچەکرە لە لوولە، سەرپێچ و ... ☰ قلاویز کردن

**قەلاّی / qełay/:** ☜ قەلاّیی

**قەلاّیچە / qełayçe/:** ناو. کەلهۆک؛ قەلاّی پچووک ☰ قلعەی کوچک

**قەلاّیی / qełayî/:** ناو. قالایی؛ قەلاّی؛ قەلا؛ قەلع؛ توخمێکی کیمیاوی کانزایی ☰ قلع؛ ارزیز

**قەڵب / qełb/:** ئاوەڵناو. ١. زەغەڵ؛ بەدەڵ ‹نەقدی دڵێ کە ڕائیجی سەودایی تۆ نەبێ/ مەغشووش و کەمعەیارە و هەم قەڵب و هەم چرووک «نالی»› ٢. */کینایە/* تەمەڵ؛ تەوەزەل (پیاو) ٣. */کینایە/* دووڕەنگ؛ دووڕوو ☰ ١. ناسره ٢. تنبل (مرد) ٣. دورو

**قەڵباز / qełbaz/:** ناو. بازی گەورە ☰ پرش بلند

**قەڵبە / qełbe/:** ناو. ١. کۆنگیرە؛ ددانەی سەر لێوەی دیوار ٢. عەیب؛ زەدە ٣. لکەدار؛ لق ٤. چقڵ؛ درک ٥. مرمەند؛ ڕنەک؛ سوان ٦. مەڕبەند؛ گولمێخ؛ بزماری درشت ☰ ١. کُنگره ٢. زده ٣. شاخەی درخت ٤. خار ٥. سوهان ٦. میخ درشت

**قەڵبەز / qełbez/:** ناو. ١. ڕەوەز؛ ڕیزەبەردی کەپکەشاخ ٢. قەڵەمباز؛ بازی زل و هەراو ٣. ئاوهەڵدێر؛ تافگە ‹خوڕەی قەڵبەزی کەفزیوینی چەم/ لە هەزار چەشنە پرشنگی ناو تەم «قانع»› ☰ ١. زنجیرەی سنگی کوه ٢. پرش بلند ٣. آبشار

**قەڵبەزە / qełbeze/:** ناو. قەلفەز؛ قەڵفەز؛ قەلوەز؛ قەلوەز؛ قەلوەزە؛ قەلەوەز: ١. شەپۆلی ڕۆبار ٢. تافگە؛ ئاوهەڵدێر ☰ ١. موج رودخانه ٢. آبشار

**قەڵبەزەن / qełbezen/:** ناو. قەڵبەژەن؛ کەسێ کە پارەی زەغەڵ دروست ئەکا ☰ سکەزن قاچاق

**قەڵبەژەن / qełbejen/:** ☜ قەڵبەزەن

**قەڵبەن / qełben/:** ناو. پشتێن؛ کەمەربەند ☰ کمربند

**قەڵبیر / qełbîr/:** ناو. بێژنگ ☰ غربال

**قەڵپ / qełp/:** ئاوەڵناو. ١. زەق؛ زۆپ ٢. زەغەڵ؛ قەڵب ☰ ١. برجسته ٢. ناسره

**قەڵپاخ / qełpax/:** ناو. ١. قالتاخ؛ کەڵبەزین ٢. کڵاوی لە پێستەمەڕ ☰ ١. قاچ زین ٢. کلاه پوستین

**قەڵپن / qełpin/:** ناو. قلپن؛ قەڵپنگ؛ کەرخنکێنە ☰ گیاهی است

**قەڵپنگ / qełping/:** ☜ قەڵپن

**قەڵپۆز** / qeɫpoz/: ☜ **قەرپۆس**

**قەڵپووت** / qeɫpût/: ئاوەڵناو. قەلپووچ: ١. پووچ؛ پووک ٢. *[مەجاز]* گلێنەی چاو دەرهاتوو ☰ ١. پوک؛ میان‌تهی ٢. کُرەی چشم تخلیه شده

**قەڵپووز** / qeɫpûz/: ☜ **قەرپۆس**

**قەڵپووس** / qeɫpûs/: ☜ **قەرپۆس**

**قەڵپە** / qeɫpe/: ناو. زەقایی؛ دەرپەڕیوی ☰ برآمدگی

**قەڵپەڵ**[1] / qeɫpeɫ/: ناو. کەل‌وپەل؛ وردە ئەسپاب؛ خرت‌وپرت؛ شڕە و بڕە؛ شڕ و شاتاڵ ☰ خرت‌وپرت

**قەڵپەڵ**[2]: ئاوەڵناو. ورد و جیا ـ جیا ☰ تکە ـ تکە

⊡ **قەڵپەڵ کردن**: ورد و توێ ـ توێ کردنەوە؛ پەل ـ پەل کردنی مەلی سەربڕاو ☰ تکە ـ تکە کردن لاشەی پرندەی ذبح شده

**قەڵت** / qeɫt/: ناو. ١. کاری توند لێ دان بە تیخ و تەور ٢. لەت؛ کوت ☰ ١. ضربت شدید با تیغ و تبر ٢. بُرش

⊡ **قەڵت کردن**: بڕین؛ لەت کردن ☰ بریدن

**قەڵتاخ** / qeɫtax/: ناو. قەڵتاغ: ١. پێستی ئەستووری دەباغ‌دراو بۆ پینەکەوش ٢. قاڵتاخ؛ کەڵبەزین ☰ ١. چرم کلفت دباغی شده برای پینەی کفش ٢. قاچ زین

⊡ **قەڵتاخ لێدان**: قەڵتاغ لێدان: ١. پینە کردنی بنی کەوش بە چەرمی ئەستوور ٢. *[کینایە]* زین کردنی ئەسپ ☰ ١. پینەی کف کفش با چرم ضخیم ٢. زین کردن اسب

**قەڵتاخەکۆن** / qeɫtaxekon/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* پیری زورهان ☰ پیر لکنته

**قەڵتاس** / qeɫtas/: ☜ **قاڵتاق**[1]

**قەڵتاغ** / qeɫtağ/: ☜ **قەڵتاخ**

⊡ **قەڵتاغ لێدان**: ☜ **قەڵتاخ لێدان**

**قەڵتان** / qeɫtan/: چاوگ. تلانـدن؛ تلاندنـەوە ☰ غلتاندن

**قەڵتاندن** / qeɫtandin/: چاوگ. ١. بڕین بە تیخ و تەور ٢. *[کینایە]* وەدەر نان؛ دەرکردن ☰ ١. بُریدن ٢. بیرون کردن

**قەڵتانن** / qeɫtanin/: چاوگ. تلاندن؛ تلاندنەوە ☰ غلتاندن

**قەڵت‌وبڕ** / qeɫt û biř/: ناو. ١. کار و ڕەوتی درشت بڕین؛ لەت و کوتی گەورە لێ کردنەوە ٢. کوشت‌وبڕ ☰ ١. عمل بریدن بە قطعات درشت ٢. قتل و غارت

**قەڵتە** / qeɫte/: ☜ **قەڵتەبان**

**قەڵتەبان** / qeɫteban/: ناو. *[ناشیرین]* قەڵتە؛ دەویت ☰ جاکش

**قەڵچغ** / qeɫçiğ/: ☜ **قاڵتاق**[1]

⊡ **قەڵچغە کردن**: زیپکە کردنی لەش بە سەرما و مووچەڕک ☰ مور ـ مور شدن پوست

**قەڵخ**[1] / qeɫx/: ناو. پێستەی لە دەباغ نەدراو ☰ پوست دباغی نشده

⊡ **قەڵخ کردن**: داڕووتاندنی پێستی حەیوانی سەربڕاو ☰ تراشیدن پوست حیوان ذبح شده

**قەڵخ**[2]: ئاوەڵناو. لەڕ و بێ‌گیان ☰ لاغرمردنی

**قەڵخان** / qeɫxan/: ناو. قەلغان؛ مەتاڵ ‹قەڵخان و شمشێر هەڵواسرانەوە «مەسەل»› ☰ سپر

**قەڵخەت** / qeɫxet/: ناو. **قەڵافەت**؛ **سەروسیما** ☰ سیما؛ قیافه

**قەڵداس** / qeɫdas/: ناو. داسوو؛ **قەلاس** ☰ سیخچه؛ اخگل

**قەڵس** / qeɫs/: ئاوەڵناو. قەرس: ١. وەڕەز؛ جاڕز ٢. تووڕە؛ هەڵچوو؛ ئاگری ٣. داڵگۆشت؛ لەجەر؛ لەڕ ٤. ترسەنۆک؛ ترسەزاور؛ کەلەزات ٥. بێ‌هونەر؛ بێ‌جەوهەر ☰ ١. بیزار ٢. عصبانی ٣. لاغر ۴. ترسو ۵. بی‌هنر

**قەڵسۆک** / qeɫsok/: ئاوەڵناو. *[پلار]* داڵگوشتی بێ‌هێز و توان ☰ لاغرمُردنی

**قەڵسە** / qełse/: ناو. هۆی تووڕە کـردن عامـل خشم

⊡ **قەڵسە گێڕان:** خەریکی تووڕە کردنـێ بـوون کوشش برای خشمگین کردن

**قەڵسەمێر** / qełsemêr/: ئاوەڵـناو. /پـلار/ ١. ترسـەنۆک؛ کەلـەزات ٢. خوێـڕی؛ بـەرەڵا ١. ترسو ٢. ولگرد؛ بیکاره

**قەڵسی** / qełsî/: نـاو. ١. جـاڕزی؛ وەڕەزی ٢. تووڕەیی ١. بیزاری ٢. عصبانیت

**قەڵش** / qełş/: ناو. قەلەش؛ قەڵشت؛ قەلەشت؛ قلاش: ١. کەلش؛ کەلشت ٢. تـرەک؛ درز ١. شکاف ٢. ترک

⊡ **قەڵش بردن:** قەڵشـان؛ قەڵـش تـێ کـەوتن شکاف برداشتن

**قەڵش تێکەوتن:** ☜ **قەڵش بردن**

**قەڵشان** / qełşan/: چـاوگ. تێنەپـەڕ. //قەڵشـای؛ دەقەڵشـێی؛ بقەڵشـێ// قەڵشـین؛ قەلاشـران؛ قەلەشـان؛ قلەشـان؛ قەلەشـتن؛ قەلەشـین؛ قلیشان؛ تلیشان؛ تلیشیان؛ تلیشیای؛ قەرشـیان؛ قلیشیان؛ شەق بردن؛ ئشکاویەی شکافته شدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: قەڵشـاو/ چـاوگی نـەرێنی: نەقەڵشان

**قەڵشاندن** / qełşandin/: چـاوگ. تێپـەڕ. //قەڵشاندت؛ دەقەڵشێنی؛ بقەڵشێنە// قلیشـاندن؛ قەلەشـاندن؛ قلەشـاندن؛ قەلاشـتن؛ قەلاشـتن؛ قلاشـتن؛ قلاشـتن؛ قەلاشـدن؛ ڤەقەلاشـتن؛ کەلاشـتن؛ ئشـکاوەی؛ کەلاشـتن؛ تلیشـاندن؛ تلیشنای؛ دڕدان؛ ترەکنـای؛ قەڵـش لـە شـتێک بەدیهێنان شکافتن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: ـــ/ چـاوگی نـەرێنی: نەقەڵشاندن

**قەڵشاندنەوە** / qełşand(i)newe/: ☜ **ڤەلاشتن**

**قەڵشاو** / qełşaw/: ئاوەڵناو. قەڵشـیو؛ تلیشـاو؛ قەلاشـتوو؛ قەڵشـیاگ؛ قلیشـیاگ؛ تلیشـیاگ؛ قلیشاو؛ ئشکاویا شکافته

**قەڵشاوی** / qełşawî/: ناو. قلیشاوی؛ تلیشیاگی شکاف

**قەڵشبردە** / qełşbirde/: ئاوەڵـناو. جـاوڕاوە ترک‌خورده

**قەڵشت** / qeɫişt/: نـاو. قـلاش؛ قلـیش؛ قەڵـش شکاف

**قەڵشەشاخ** / qełşeşax/: نـاو. گابـارە؛ شـکێڕ شکاف در صخره‌ی کوه

**قەڵشیاگ** / qełşyag/: ☜ **قەڵشاو**

**قەڵشیان** / qełşyan/: چاوگ. ترەکان؛ زەنگ بردن ترکیدن

**قەڵشین** / qełşîn/: ☜ **قەڵشان**

**قەڵشیو** / qełşîw/: نـاو. ؛ تلیشـاو؛ قەلاشـتوو؛ قەڵشیاگ ‹دەستی قەڵشیو، پـێ ڕاگـیراو/ گیرفـانی دڕاو، بێ دڕاو «هێمن»› شکافته

**قەڵغان** / qełğan/: ناو. قەڵخان: ١. قەلان؛ مەتاڵ؛ چەکێکی قەدیم کە لـە کەوڵـە کەرگـەدەن یـان کانزا بۆ پارازتن لە شمشێر بە دەسـتەوە دەگـیرا ‹تا ئێستە ڕووی نەداوە لە تاریخی میللەتا/ قەڵغانـی گوللە سنگی کچان بێ لە هەڵمەتا «پیرەمێـرد»› ٢. دڕووە کەنگری وشکەوەبوو ١. سپر ٢. سـاقەی خاردار خشکیده‌ی کنگر

**قەڵغانە** / qełğane/: نـاو. نەخشـێکە لـە چیغـی چادردا نقشی در چیغ چادر

**قەڵفەز** / qełfez/: ☜ **قەڵبەزە**

**قەڵقەڵاشک** / qełqełaşk/: ☜ **قانگەلاش**

**قەڵماس** / qełmas/: ☜ **قەڵماسك**

**قەڵماسک** / qełmasik/: نـاو. قاڵماسک؛ قاڵماسکە؛ قەڵـماس؛ قەڵماسـن؛ قلماسـک؛ قەڵماسـەنگ؛ قانک؛ قەپانچە؛ قۆچەقانی؛ کـەهنیک؛ بـەرەقانی فلاخن

**قەڵماسن** / qełmasin/: ☜ **قەڵماسك**

**قەڵماسەنگ** / qełmaseng/: ☜ **قەڵماسك**

**قەڵماندن** / qełmandin/: چاوگ. قەوماندن؛ هەڵاییساندن ■ جنجال برپا كردن

**قەڵمباز** / qełimbaz/: ناو. باز؛ بازباز؛ بازبازێن ■ پرش

**قەڵوەز** / qełwez/: ☜ **قەڵبەزە**

**قەڵوەزە** / qełweze/: ☜ **قەڵبەزە**

**قەڵو¹** / qełû/: ناو. بەردی لووسی تەختی چەم ■ شن صاف بستر رودخانە

**قەڵو²**: ئاوەڵناو. ناڵەبار؛ ناحەز ■ ناهنجار

**قەڵەباڵغ** / qełebałiğ/: ☜ **قەرەباڵغ**

**قەڵەتێن** / qełetên/: ئاوەڵناو. ئەستوور ■ کُلُفت

**قەڵەش** / qełeş/: ☜ **قەڵش**

**قەڵەشان** / qełeşan/: ☜ **قەڵشان**

**قەڵەشاندن** / qełeşandin/: ☜ **قەڵشاندن**

**قەڵەشت** / qełeşt/: ☜ **قەڵش**

**قەڵەشتن** / qełeştin/: ☜ **قەڵشان**

**قەڵەشین** / qełeşîn/: ☜ **قەڵشان**

**قەڵەم** / qełem/: ناو. ١. پێنووس؛ ئامرازی نووسین ٢. ئاسنی نووکتیژی وەک سنگ کە بەرد و داری پێ دەکۆڵن ٣. هەندێ پارە ‹قەڵەمێکم پارە داوەتێ› ٤. ئێسکی درێژی دەست و پێ ‹بەو کەوتنە قەڵەمی پێم شکا!› ٥. ☜ **قەڵەمە ـ١** ٦. ڕەوتی قرتان؛ پەڕین ‹قامکێکی قەڵەم بووە› ■ ١. قلم ٢. قلم نجاری و سنگتراشی ٣. مبلغ ٤. قلمە؛ استخوان دراز ٥. ☜ **قەڵەمە ـ١** ٦. فرایند قطع شدن

⊡ **قەڵەمی ئاسن**: ئاسنێکی کورتی سەرتیژە دارکار و سنعەتگەر دەکاری دەکەن ■ قلم آهنی

⊡ **قەڵەم دادان**: نووکەقەڵەم تاشین ■ قلم تراشیدن

**قەڵەم کردن**: ١. پەڕاندن؛ قرتاندن بە تیخ ٢. تاشینی ڕدێن لەملاولاوە ■ ١. پی کردن؛ قطع کردن ٢. اصلاح و مُرتب کردن ریش

**قەڵەم لێدان**: ١. قەڵەمە ناژتن؛ داروو‌کەی شینی بێڕەگ چەقاندن ٢. تووسینی خودایی ■ ١. کاشتن شاخەی جوان ٢. رقم خوردن

**لە قەڵەم کەوتن**: لە بیر چوون ■ از قلم افتادن

**قەڵەمئووچ** / qełem'ûç/: ناو. ئالای خۆکار؛ بنووسی بە مەرەکەفی هێندێک وشکەوە ■ قلم خودکار

**قەڵەمان** / qełeman/: ☜ **قەڵەمدان**

**قەڵەمانە** / qełemane/: ناو. مزی دوعانووس ■ مُزد دعانویس

**قەڵەمانین** / qełemanîn/: ناو. بازی بە قەڵەمان ■ بازی با قلمدان

**قەڵەمباز** / qełembaz/: ناو. حەمباز؛ قەڵەمبازد؛ بازی زل و هەراو ■ پرش بُلند

⊡ **قەڵەمباز دان**: پەڕین بە هەنگاوی هەراو ■ بلند پریدن

**قەڵەمبازد** / qełembazd/: ☜ **قەڵەمباز**

**قەڵەمبڕ** / qełembiř/: ناو. قەڵەمتاش؛ قەڵەمتراش؛ قەڵەمتەراش؛ چەقۆی چکۆلە بۆ قەڵەم دادان ■ قلمتراش

**قەڵەمپاندان** / qełempandan/: ناو. خۆنووس؛ پاندان ■ قلم خودنویس

**قەڵەمتاش** / qełemtaş/: ☜ **قەڵەمبڕ**

**قەڵەمتراش** / qełemt(i)raş/: ناو. ١. ☜ **قەڵەمبڕ** ٢. سمتراش؛ ناڵبەند ■ ١. ☜ **قەڵەمبڕ** ٢. نعلبند

**قەڵەمتۆز** / qełemtoz/: ناو. دارێکە وەک چنار وایە، گەڵاکەی دەرمانە ■ درختی است

**قەڵەمتەراش** / qełemteraş/: ☜ **قەڵەمبڕ**

**قەڵەمچی** / qełemçî/: ناو. [کینایە] بازرگانی تووتنکڕ ■ تاجر توتون

**قەڵەمخەت** / qełemxet/: ناو. قەڵەمی زەل؛ قامر

بۆ نووسین ☰ قلم‌خط

**قەڵەمدان** / qełemdan/: ناو. قەڵەمان؛ قوتووی قەڵەم و مەرەکەف ☰ قلمدان

**قەڵەمڕەساس** / qełemřesas/: ناو. قەڵەمزریچ؛ میداد؛ جۆرێ قەڵەم کە ماکی گرافیتی تێدایە و خۆنووسە ☰ مداد

**قەڵەمڕەو** / qełemřew/: ناو. ١. مەڵبەند؛ ناوچە؛ وڵکە؛ ئۆلکە؛ پێگەشت ‹قەڵەمڕەوی هەرێمی کوردستان› ٢. بوار؛ بەستێنی هەڵس‌وکەوت و تێیدا کار کردن ‹قەڵەمڕەوی شیعر و وێژەوانی› ☰ ١. قلمرو ٢. زمینه

**قەڵەمزریچ** / qełemz(i)rêç/: ☜ قەڵەمڕەساس

**قەڵەمقۆپیە** / qełemqop(i)ye/: ناو. جۆرێ قەڵەمڕەساس کە شین دەنووسێ ☰ مداد کُپی

**قەڵەمگیر** / qełemgîr/: ناو. سنگولکە ئاسنێکە لە ئاسیاودا ☰ ابزاری در آسیاب

**قەڵەمو** / qełemû/: ناو. پرچۆک؛ قەڵەمێ کە سەرەکەی چەپکێکی مووە، بۆ ڕەنگ کردن بە کار دێت ☰ قلم‌مو

**قەڵەمە** / qełeme/: ناو. ١. قەڵەم؛ قلوومک؛ قەرەم؛ قەرەمە؛ قەرم؛ کەڵەمە؛ سیخک؛ لقێ لە گیا کە لە لقی سەرەکی دەکەنەوە و لە زەوی دەنێن شین ببێ ٢. توانای باسک و قاچ ☰ ١. قلمه ٢. توان پا و بازو

⊡ **قەڵەمە کردن**: ١. شکاندنی ئێسکە درێژەکانی دەست و پێ ‹لێیان داوە جووت پێیان قەڵەمە کردووە› ٢. قەڵەمە لێدان ‹داری زەیتوون بە قەڵەمە کردن زیاد دەکا› ☰ ١. قلم کردن ٢. قلمه کردن

**قەڵەمە لێدان**: پەل لێدانەوە؛ شێنە لێدان ☰ قلمه زدن

**قەڵەمەزەردە** / qełemezerde/: ناو. چاوسپیلکە؛ دڕکێکە ☰ خاری است

**قەڵەمەهاڕ** / qełemehař/: ناو. گردەبڕ؛ جۆرێک شکانی دەست و لاق بە جۆرێ کە تەکەی بێ ☰ شکستگی نزدیک به قطع دست و پا

**قەڵەمی** / qełemî/: ناوەڵناو. *[کنایە]* ١. باریک و جوان و ڕێک ٢. خوێندەوارانەی وا کە هەموو کەس تێ نەگا ☰ ١. قلمی؛ باریک ٢. رسمی و لفظ قلم

**قەڵەنگ** / qełeng/: ☜ قەڵاگ

**قەڵەو** / qełew/: ناوەڵناو. قەرەو: ١. گۆشتن؛ پڕگۆشت ٢. چەور؛ چەروو ٣. *[کنایە]* دەوڵەمەندی زل ☰ ١. چاق ٢. چرب ٣. ثروتمند بزرگ

⊡ **قەڵەو بونەوە**: ١. گۆشت گرتن ٢. *[کنایە]* دەوڵەمەند بوونەوە ☰ ١. چاق شدن ٢. ثروتمند شدن

**قەڵەوایی** / qełewayî/: ناو. چەورایی چێشت ☰ چربی غذا

**قەڵەوەز** / qełewez/: ☜ قەڵبەزە

**قەڵەوی** / qełewî/: ناو. چاخی؛ قۆڵایی؛ قەرەوی ☰ چاقی

**قەڵەویچکە** / qełewîçke/: ناوەڵناو. بڕێ قەڵەو ☰ قدری چاق

**قەڵیشک** / qełîşk/: ناو. ناوی گیایەکە ☰ گیاهی است

**قەڵینگ** / qełîng/: ناو. گیایەکە وەک کەرخنکێنە وایە ☰ گیاهی است

**قەڵیە** / qełye/: ناو. ١. ☜ قەڵی ٢. قلیە؛ چێشتێکە گۆشت و مەویژ و بەی تێدایە ☰ ١. ☜ قەلی ٢. آش قلیه

**قەم**[1] / qem/: ☜ قەمتەرە ـ١

**قەم**[2]: ناوەڵناو. ١. پووک؛ پووچەڵ ٢. وشک؛ زوها ☰ ١. پوک ٢. خُشک

**قەمارە** / qemare/: ناو. قەمەرە: ١. ماشینی

سەواری ٢. ژووری چەند کەسی لە شەمەندەفەر ☰ ١. ماشین سواری ٢. کوپەی قطار

**قەمامە / qemame/**: ناو. ١. ☜ **قومامە** ٢. گیایەکە وەک گەنم دەچێ ٣. کاری تەقەڵ دانی تێر لە ناوەڕاستدا، بۆ شۆڕ نەبوونەوەی ☰ ١. ☜ **قومامە** ٢. گیاهی است ٣. عمل دوخت وسط خورجین

**قەمان / qeman/**: چاوگ. ١. وشک بوون (داری تەڕ و ...) ٢. پرتووکان؛ پرتووکیان ☰ ١. خشکیدن (هیزم تر و ...) ٢. پوسیدن

**قەماندن / qemandin/**: چاوگ. ١. وشک کردنەوە: *ئا)* داری تەڕ و ... بە ئاور *ب)* جلکی تەڕ تێوەشاندن بۆ وشک بوونەوە *پ)* نان بە ئاگر ڕاداشتن تا ڕەق بوون ٢. پشت گرتن؛ پاراستن ☰ ١. خشک کردن: *الف)* هیزم تر و ... *ب)* لباس خیس بر تنور گرفتن *ج)* نان بر آتش گذاشتن ٢. حمایت کردن

**قەمبوور / qembûr/**: ناوەڵناو. کۆم؛ قەموور؛ پشتچەماو ☰ کوژپُشت

**قەمبەرە / qembere/**: ☜ **قومبەرە**

**قەمت / qemt/**: ناو. ١. پێسیر؛ یەخە؛ قەلقەلە ٢. شەنگلەبەرەکەتە؛ شمڵی بەرەکەت ☰ ١. گریبان؛ یقه ٢. میوەی دوقلوی به هم چسبیده

**قەمتار / qemtar/**: ناو. کەمتار؛ کەمتیار ☰ کفتار

**قەمتاڵ / qemtał/**: ناو. ڕەگی کلاوبن؛ ڕەگ و بنی گەلاڕێواس ☰ ریشەی نوعی ریواس

**قەمتاندن / qemtandin/**: چاوگ. ١. پێچاندنەوە و توند بەستنەوە (وەک: بابۆڵەپێچ کردنی منالی ساوا) ٢. چەسپاندن؛ پێوە نووساندن ٣. بە تینی ئاگر سووتاندن ☰ ١. پیچیدن و محکم بستن (مانند: قُنداق پیچ کردن نوزاد) ٢. چسباندن ٣. سوزاندن

**قەمتک / qemtik/**: ناو. ١. دەسرۆکەی سەری ژنان ٢. قەمچک؛ پشتمل ☰ ١. لچک ٢. پس گردن

**قەمتەر[1] / qemter/**: ناو. قەنتەر: ١. دەمبێنی حەیوان ٢. خەزێمی بێقلی وشتر و ورچ و ... کە بەنی تێ دەخرێ ☰ ١. پوزەبند ٢. مهار؛ خطام شتر و...

⊡ **قەمتەر کران**: ١. قەپۆز بەسران ٢. *[کینایە، پلار]* بێدەنگ کران ‹چاو لە بەغدا/ قوون لە تاران/ گوێچکە لە شام/ لە ئەنقەرەش قەمتەر کران/ کەوماری کورد «پەشێو»› ☰ ١. پوزە بستە شدن ٢. ساکت گردیدن

**قەمتەر کردن**: ١. دەم بەستن بە زنجیر ٢. *[کینایە]* بێدەنگ کردن ☰ ١. پوزە بستن ٢. ساکت کردن

**قەمتەر[2]**: ناوەڵناو. *[کینایە]* قەنتەر؛ ڕژد و چکووس ☰ خسیس

**قەمتەرکراو / qemterk(i)raw/**: ناوەڵناو. **قەمتەری**: ١. دەمبەستراو ٢. *[کینایە]* ڕژد؛ چکووس ☰ ١. پوزە بستە ٢. خسیس

**قەمتەرە / qemtere/**: ناو. ١. قەم؛ قەنتەرە؛ قەینتر؛ ئاوبارە؛ داری درێژ و ئەستوور و کۆڵدراو کە بۆ پەڕاندنەوەی ئاو بە سەر کەنداڵیدا دەکێشن و دەبێتە جۆگە ٢. سەردەرانە؛ ئاسانەی درگا ٣. پەتی بەستنی خێوەت ☰ ١. قنطرە ٢. آستانەی در ٣. ریسمان بستن چادر

**قەمتەری / qemterî/**: ☜ **قەمتەرکراو**

**قەمتی[1] / qemtî/**: ناو. ئەوندە گیایە کە لە دەستا جێ ببێتەوە ☰ پُر یک دست گیاه دسته شده

**قەمتی[2]**: ناوەڵناو. گرێدراو؛ پەیوەندی ☰ وابسته

**قەمتین / qemtîn/**: چاوگ. سووتان لە بەر تینی ئاگر ‹گۆرەیا من ل بەر سۆیێ قەمتی› ☰ سوختن

**قەمچ[1] / qemç/**: ناو. ١. لاوێچ؛ پڕی دەستێک ٢. باو؛ با؛ پێچ ٣. چەوی لووسی دەم چەم ٤. مووی بە قەیچی هەڵپاچراو ٥. کاری پەرتاوتنی دار ٦. *[کینایە]* کلکی حەیوان ☰ ١. پُر یک کف دست ٢.

پیچ؛ تاب ۳. شن صاف کنار رودخانه ۴. موی قیچی شده ۵. هرس درخت ۶. دُم حیوان

▣ **قەمچ تێ کەوتن**: ۱. پێچ تێ کەوتن ۲. *[کینایە]* تەگەرە پێش هاتن؛ قۆرت تێ کەوتن ☰ ۱. تاب افتادن ۲. مانع پیش آمدن

**قەمچ خواردن** پێچ خواردن؛ لوول خواردن ☰ تاب خوردن

**قەمچ کردن** نیشان کردنی بزن و مەڕ بە هەڵپاچینی هێندێ کوڵکە ☰ علامت گذاشتن روی دام با قیچی کردن بخشی از پشم و مو

**خستە قەمچ** بردن و نەدانەوە ‹هەر کە رووم هەڵچەرخاند، قەڵەمەکەمی خستە قەمچ!› ☰ کش رفتن

**قەمچ**[۲]: ناوەڵناو. دووڕەگە (تاژی) ☰ دورگه

**قەمچ**[۳]: ☜ قەرە[۳]

**قەمچان** / qemçan/: ناو. قاچوو؛ قاچێن؛ بازەڵێن؛ یارییەکی دوو یان چەند کەسییە بە پێنج چەوی خڕکەڵەوە دەکرێ ☰ یەقُل‌دوقُل

**قەمچاندن** / qemçandin/: چاوگ. پێچان؛ باو پێ دان ☰ پیچاندن

**قەمچاندنەوە** / qemçand(i)newe/: چاوگ. پێچاندن؛ باو دان ☰ پیچاندن

**قەمچاوپێچ** / qemçawpêç/: ناوەڵناو. قەمچ‌وپێچ؛ پێچەڵپێچ؛ پێچاوپێچ ‹ڕێگایەکی زۆر قەمچاوپێچە!› ☰ پُرپیچ و خم

**قەمچقەمچۆکە** / qemçqemçoke/: ناو. گوڵێکی بنەوشە نیو متیر بەرز دەبێتەوە، منالان کڵاوە گولینەی پێ دروست دەکەن ☰ از گُل‌ها

**قەمچک** / qemçik/: ناو. ۱. دووی بزن ۲. قونچکی میوە ۳. پشتی مل ☰ ۱. دُم بُز ۲. شاخەی انتهای میوە ۳. پس گردن

**قەمچکەرە** / qemçkere/: ناو. باڵندەیەکی بچووکی بۆرە لە بن بەردی شاخان هێلانە دەکا و لە جیاتی پووش، لە سەر بەردی پان و چکۆلە هێلکە دەکا ☰ از پرندەها

**قەمچنای** / qemç(i)nay/: چاوگ. قەمچنایۆ؛ پێچاندن ☰ پیچاندن

**قەمچنایۆ** / qemç(i)nayo/: ☜ قەمچنای

**قەمچوپێچ** / qemçûpêç/: ناوەڵناو. قەمچاوپێچ؛ پێچاوپێچ ‹ڕێگەی قەمچوپێچ› ☰ پُرپیچ و خم

**قەمچۆک** / qemçok/: ☜ قاپۆلکە

**قەمچوور** / qemçûr/: ناو. خەمچوور؛ پووشانە و سەرانەی مالات بۆ ئاغا و دەوڵەت ☰ مالیات دام و احشام

**قەمچی** / qemçî/: ناو. ۱. قامچی؛ شەلاخ ۲. چێوی پەت پێوە بەسراوی کایەی مزراحێن کە مزراحی پێ با دەدەن ۳. جۆرێ خشڵی ژنانە ☰ ۱. تازیانە ۲. چوبک و تسمەی نوعی بازی ۳. از زیورآلات

**قەمچیان** / qemç(i)yan/: چاوگ. پێچ خواردن ☰ تاب خوردن

**قەمچیانەوە** / qemç(i)yanewe/: چاوگ. پێچ خواردنەوە ☰ باز تاب خوردن

**قەمچیای** / qemç(i)yay/: چاوگ. قەمچیایۆ؛ پێچ خواردن ☰ تاب خوردن

**قەمچیایۆ** / qemç(i)yayo/: ☜ قەمچیای

**قەمچیشێلاق** / qemçîşêlaq/: ناو. قەمچیەشەلاق؛ گیایەکە وەک کەرخنکێنە لە مێرگدا دەڕوێ ☰ گیاهی است

**قەمچیەشەلاق** / qemç(i)yeşelaq/: ☜ قەمچیشێلاق

**قەمراندن** / qemrandin/: چاوگ. ۱. برژاندن؛ لە سەر ئاور بریان کردن ۲. سوور کردنەوە؛ لە ناو ڕۆنی داخ براشتن ☰ ۱. کباب کردن ۲. سُرخ کردن

**قەمرددین** / qemreddîn/: ☜ قەمەردین

**قەمرین** / qemirîn/: چاوگ. برژان؛ برژیان؛ لە سەر

ئاگر یان لە بەر تاو ڕەنگ توخ بوونەوە ‹نان قەمرییە؛ ل بەر تاڤێ قەمرییە› 🇮🇷 برشتن

**قەمرین** / qemrîn/: چاوگ. خەمبار بوون 🇮🇷 غمگین بودن

**قەمزە** / qemze/: ناو. ١. ناز؛ عیشوە ٢. بەرگ؛ بەرگی نووشتە 🇮🇷 ١. غمزه و ناز ٢. جلد (کتاب)

**قەمزەنووشتە** / qemzenûşte/: ناو. بەرگەنووشتە 🇮🇷 پوشش دعای نوشته

**قەمس** / qems/: ناو. ناڕاستی؛ قوڕۆک؛ فێڵ و گزی 🇮🇷 حیله؛ نیرنگ

**قەمسەڵە** / qemsele/: ناو. چاکەتی گەرمی زستانە کە لە سەرەوە دەپۆشرێ 🇮🇷 کاپشن

**قەمسی** / qemsî/: ئاوەڵناو. ناڕاست؛ دەغەڵ ‹ڤان سادق و راست و خێرخواهان/ ڤان قەمسی و خوار و رووسیاهان «خانی»› 🇮🇷 دغلباز

**قەمقەمچۆکە** / qemqemçoke/: ناو. گوڵێکی بنەوشە تا ٥٠ سانتیمیتر بالا دەکا، منالان کلاوەگوڵینەی لێ دروست دەکەن 🇮🇷 گیاهی است

**قەمک** / qem(i)k/: ناو. قەمکە؛ تەڕدەست؛ کیسەبڕ؛ دزی بەدەست و خێرا 🇮🇷 طرّار؛ دُزد ماهر

**قەمکە** / qemke/: ☜ قەمك

**قەملاخ** / qemlax/: ناو. ڕاوەکەو بەبێ چەک 🇮🇷 شکار کبک در برف

**قەممە** / qemme/: ناو. کاهوور؛ قام؛ تیخێکی دەمپانە لە نێوان خەنجەر و شیردایە 🇮🇷 قمه

**قەمۆچکە** / qemoçke/: ناو. زارکی گڕکان 🇮🇷 دهانەی آتشفشان

**قەموور** / qemûr/: ☜ قەمبور

**قەمووش** / qemûş/: ناو. سارێژ؛ توێخی باش پەڕینە سەر زام 🇮🇷 التیام

**قەمووشک** / qemûş(i)k/: ↓

⊡ **قەمووشک گرتن**: ١. سارێژ بوون؛ خۆش بوونەوە ٢. بە گا بوون؛ کەشاو هاتنەوەی زەوی 🇮🇷 ١. التیام یافتن ٢. نیمخشک شدن زمین آبیاری شده

**قەمە** / qeme/: ناو. قەدارە؛ غەدارە؛ قەسەتۆرە؛ کەتارە؛ نجدە؛ جۆرێ شمشێری کورت و دەمپان 🇮🇷 قمه؛ قدّاره

**قەمەر**[1] / qemer/: ناو. ئەسپی سووری ئاماڵڕەش؛ کوێتی داوێن تاریک 🇮🇷 کُمیت

**قەمەر**[2]: ئاوەڵناو. سەوزە؛ ئەسمەر 🇮🇷 گندمگون

**قەمەردین** / qemerdîn/: ناو. قەمرەددین؛ نانەقەیسی؛ میوەی پانەوەکراوی وشک کراو 🇮🇷 لواشک

**قەمەرە** / qemere/: ☜ قەمارە

**قەمەری** / qemerî/: ناو. پارەی ورد؛ قۆشە؛ فلس؛ شایی؛ فەتالی 🇮🇷 پشیز؛ پول خُرد

**قەمەزن** / qemezen/: ناو. ١. چەقۆکێش؛ شەلاتی ٢. کەسێ لە عاشووورادا بە قەمە خۆی بریندار دەکا 🇮🇷 ١. چاقوکش ٢. قمەزن

**قەمهاندن** / qemhandin/: چاوگ. بنەبڕ کردن 🇮🇷 قلع و قمع کردن

**قەمهین** / qemhîn/: چاوگ. لە ناو چوون 🇮🇷 قلع و قمع شدن

**قەمی** / qemî/: ئاوەڵکار. ڕەنگە؛ وێدەچێ؛ ئەشێ؛ دەبێ 🇮🇷 شاید؛ چه بسا

**قەمیش** / qemîş/: ناو. ١. قامیش؛ زەل؛ چیت؛ چیتک ٢. پەڕە سیغارێ کە ئاغزی تێدایە و توتنی تێ دەکەن 🇮🇷 ١. نی ٢. نوعی کاغذ سیگار فیلتردار

**قەن** / qen/: ناو. قەند؛ خەند؛ کەن؛ بەرهەمی بلۆرینی سپی و شیرینی چۆنەری قەند یان قامیش 🇮🇷 قند

**قەنا** / qena/: ئاوەڵکار. بە لانی کەم؛ هیچ نەبێ 🇮🇷 حداقل؛ اقلاً

**قەنات** / qenat/: ناو. کارێز؛ کەرێز؛ نۆین 🇮🇷 قنات

**قەناد** / qenad/: ناو. شیرینیپێژ؛ کەسێ کاری

دروست کردن و فرۆشتنی شیرنییە ☰ قنّاد

**قەنادی** / qenadî/: ناو. شیرینیخانە؛ دوکانی فرۆشتنی شیرنی ☰ قنادی

**قەنارە** / qenare/: ناو. ١. چنگاڵە ئاسنی گۆشت پێدا لەقاندنی قەسابان ٢. سێدارە؛ داری پێخنکاندنی تاوانبار ‹هەوای نەفەس گەرووگیرە/ قەنارەم قوولایی بیرە «گۆران»› ☰ ١. چنگک قصّابی ٢. دار اعدام

**قەناری** / qenarî/: ناو. کەناری؛ کناری؛ کەنارە؛ جونە؛ پەلەوەرێکی چووکەلەی زەردی دەنگخۆشە ☰ قناری

**قەناس**[١] / qenas/: ناو. قەنگاس؛ دەوروبەری ماڵ ☰ برفانداز خانە

**قەناس**[٢]: ناوەڵناو. قەنگاس؛ خێچ و خوار؛ لایەک تەسک و لایەک پان. هەروەها: **قەناسی** ☰ کج؛ قناس

**قەناسە** / qenase/: ناو. جۆرێ چەک ☰ نوعی اسلحەی گرم

**قەناعەت** / qena'et/: ناو. ١. دۆخی دەستپێوەگرتن؛ بە کەم ڕەزا دان ‹قەناعەت دەکەم و منەتی کەس نابەم› ٢. ڕەزامەندی؛ دۆخی قایل بوون ‹من قەناعەتم هەیە، ئەو ڕەزا نادا› ٣. ڕا؛ دۆخی بۆچوون ‹بە قەناعەتی من هێندێکی تر کاری ماوە› ☰ ١. قناعت ٢. رضایت ٣. رای؛ نظر

◘ **قەناعەت کردن**: دەست پێوە گرتن؛ زێدە نەخواستن ☰ قناعت کردن

**قەناعەت هەبوون**: ١. ڕەزامەند بوون؛ ڕازی بوون ٢. ☜ **قەناعەت هێنان** ☰ ١. راضی بودن ٢. ☜ **قەناعەت هێنان**

**قەناعەت هێنان**: قەناعەت هەبوون؛ قانع بوون؛ مل هێنانە ڕاستی ☰ قانع شدن

**قەناو** / qenaw/: ناو. قاناو؛ کاناڵی ئاوەڕۆی قەراغ شەقام ☰ جوی

**قەناوێز** / qenawêz/: ناو. قەنەوز؛ خامەک؛ پارچەیەکی ئاوریشمی بە ڕەنگی بنەوش یان ئەرخەوانی ☰ قناویز؛ نوعی پارچەی ابریشمی

**قەنبەل** / qenbel/: ناو. لای چەپ ☰ یسار؛ طرف چپ

**قەنتار** / qentar/: ناو. قەتاری چارەوێ ☰ قطار ستور

**قەنتارقینشەلە** / qentarqînşele/: ناو. کەمتار؛ کەمتیار ☰ کفتار

**قەنتەر** / qenter/: ☜ **قەمتەر**

**قەنتەرە** / qentere/: ☜ **قەمتەرە ـ١**

**قەنج** / qenc/: ناوەڵناو. ١. قانج؛ باش؛ خاس؛ پەسند ٢. جوان؛ خوشیک ☰ ١. خوب ٢. زیبا

◘ **قەنج کردن**: کاری چاک کردن؛ باش کردن ☰ کار نیکو کردن

**قەنجانی** / qencanî/: ناو. پیاوەتی؛ جوامێری؛ چاکە؛ مێرانی ☰ مردانگی

**قەنجەلیسک** / qencelîsk/: ناو. قەنجەیسک؛ خەنجەلیسک؛ سێبنەرد؛ بنەردی؛ سێوەبنئەرز ☰ سیبزمینی تُرشی

**قەنجەیسک** / qenceyisk/: ☜ **قەنجەلیسک**

**قەنجی** / qencî/: ناو. ١. چاکە؛ خاسی ‹قەنجیا بکە، باڤێژە ئاڤێ «مەسەل»› ٢. جوانی؛ دەلالی ☰ ١. خوبی ٢. زیبایی

**قەنجینەزان** / qencînezan/: ناوەڵناو. سپڵە؛ پێنەزان؛ نمەکنەناس؛ بێسفەت ☰ ناسپاس

**قەند** / qend/: ☜ **قەن**

**قەنداخ** / qendax/: ناو. قەنداغ؛ قەنداو؛ ئاوی کولاوی بە قەن شیرینکراو ☰ قنداغ

**قەنداغ** / qendağ/: ☜ **قەنداخ**

**قەندان** / qendan/: ناو. قەندوو؛ جێگەی قەند ☰ قندان

**قەنداو** / qendaw/: ناو. ١. ئاوی شیرنکراو بە

شـەکر ٢. ☜ قەنداخ ☰ ١. شکراب ٢. ☜ قنداخ

**قەندرخە / qendirxe/**: ناو. قەندرغە؛ گیایەکە لە گەنم دەچێ ☰ گیاهی شبیه گندم

**قەندرغە / qendirğe/**: ☜ **قەندرخە**

**قەندشکێن / qendş(i)kên/**: ناو. چەکوشی قەند پێ لەت کردن ☰ قندشکن

**قەندن / qendin/**: چاوگ. کەندن؛ کۆڵین؛ کەنن ☰ کندن

**قەندو / qendû/**: ☜ **قەندان**

**قەندە / qende/**: ناو. ١. باس‌قەننە؛ سەبیلەی کلک‌درێژ ٢. نێرگەلە؛ قلیان ئاوی ☰ ١. چُپُق دسته بُلند ٢. قلیان

**قەندەدار / qendedar/**: ناو. قەنگەدار؛ قەننەدار؛ نۆکەرێ کە لە دیوانی گەورەپیاواندا کاری قلیان و سەبیلە تێ‌کردنە ☰ نوکری کە کارش قلیان و چُپُق چاق کردن است

**قەندەڕێژ / qendeřêj/**: ناو. قەنگەڕێژ؛ قەننەڕێژ؛ تووتنی ئامادەکراو بۆ سەبیلە ☰ توتون آمادە شدە برای چُپُق

**قەندەکێش / qendekêş/**: ئاوەڵناو. قەنگەکێش؛ قەننەکێش؛ ئالوودە بە تووتن کێشان ☰ دودی؛ آلودە بە قلیان

**قەندەهاری / qendeharî/**: ناو/ ئاوەڵناو. قەنگەهاری؛ جۆرێ تۆمی گەنم ☰ نوعی گندم

**قەندهەنگوین / qendheng(i)wîn/**: ناو. *[کینایە]* شەکرەسێو؛ هەر شتێکی شیرن و بە زار خۆش ☰ شکرپارە

**قەندی / qendî/**: ناو. غەڵدی؛ تولەی ڕاو ☰ تولەسگ شکاری

**قەندیل / qendîl/**: ناو. ١. چلچرا؛ چرای بە بنەبانەوە داڵەقاو ٢. کلیلە؛ چلوورە؛ پارچە سەهۆڵی شۆڕەوە بوو ☰ ١. لوستر ٢. قندیل

**قەندیلە / qendîle/**: ناو. قەنیلە: ١. فتیلەچرا؛ قوتیلکەچرا؛ قودیلەچرا ٢. قوتکەی سەری کڵاو ☰ ١. چراغ موشی ٢. نوک تیز کُلاه

**قەنشکێن / qenşkên/**: ناو. قەنەشکێن؛ چەکوچی دەم‌پان بۆ شکاندنی قەند ☰ قندشکن

**قەنگاس / qengas/**: ☜ **قەناس**

**قەنگە / qenge/**: ☜ **قلیان**

**قەنگەدار / qengedar/**: ☜ **قەندەدار**

**قەنگەڕێژ / qengeřêj/**: ☜ **قەندەڕێژ**

**قەنگەکێش / qengekêş/**: ☜ **قەندەکێش**

**قەنگەلاشک / qengelaş(i)k/**: ☜ **قانگەلاش**

**قەنگەڵاشک / qengełaş(i)k/**: ☜ **قانگەلاش**

**قەنگەهاری / qengeharî/**: ☜ **قەندەهاری**

**قەننە / qenne/**: ☜ **قلیان**

**قەننەدار / qennedar/**: ☜ **قەندەدار**

**قەننەڕێژ / qenneřêj/**: ☜ **قەندەڕێژ**

**قەننەکێش / qennekêş/**: ☜ **قەندەکێش**

**قەنوس / qenûs/**: ناو. ڕەشی زۆر ڕەش ☰ سیاه غلیظ

**قەنوسی / qenûsî/**: ئاوەڵناو. بە ڕەنگی ڕەشی زۆر تۆخ ☰ بە رنگ سیاه غلیظ

**قەنە / qene/**: ئامراز. وا نییە؛ نە وایە؛ وشەی پرسیار ☰ مگر نە

**قەنەپە / qenepe/**: ناو. قەنەفە؛ قورسی درێژووکەی سێ-چوار نەفەرە؛ نیوەتەختی لە سەر نووستن ☰ کاناپە

**قەنەشکێن / qeneşkên/**: ☜ **قەن‌شکێن**

**قەنەفڕ / qenefiř/**: ☜ **قەرەنفول**

**قەنەفڵ / qenefił/**: ☜ **قەرەنفول**

**قەنەفڵێ / qenef(i)łê/**: ناو. سەر تەنگەی کورتان ☰ ریسمان بالای تنگ پالان

**قەنەفە / qenefe/**: ☜ **قەنەپە**

**قەنەقینە / qeneqîne/**: ناو. گەنە ـ گەنە؛ یاوکوژە؛

دەرمانەلەرز ☰ گنه ـ گنه

**قەنەک / qenek/:** ☜ **قرقرە**

**قەنەواچە / qenewaçe/:** ناو. ئـاخن؛ ناوئـاخنی جلک ☰ لایی؛ آگنەی لباس

**قەنەوز / qenewiz/:** ☜ **قەناوێز**

**قەنی / qenî/:** ناو. ١. بەچکەبزنێ کە دێر لە دایک بووبێـت ٢. ئاژەڵـی پووتەکـەی دالگۆشـت ☰ ١. بُزغالەی دیر زادە ٢. بُز و گوسفند لاغر و کوچک

**قەنیلە / qenîle/:** ☜ **قەندیلە**

**قەو / qew/:** ناو. ١. قاو؛ دەنگی بەرز ٢. ☜ **قەد**[1] ٣. هێز؛ قوە ‹ڕۆڵەم بەزەییت بە بابی خۆتـدا نایـە؟/ مەمشێلە بە قـەو بـە هـێمنی پـێم لـێ نـێ «هـەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ٤. پیفێ؛ چەشنێ قارچکی نەرمە، خەڵکی دەشتەکی بۆ هەڵکردنی ئـاور بـە کاریان دێنا ☰ ١. بانگ؛ صدای بلند و قوی ٢. ☜ **قەد**[1] ٣. قدرت ۴. پُد؛ نوعی قارچ

**قەوات / qewat/:** ناو. نەرینک؛ ئاکار؛ خۆ؛ خـوو ☰ خوی؛ اخلاق

**قەواتی / qewatî/:** نـاو. چـیرۆک؛ حەکایـەت ☰ داستان؛ افسانە

**قەواخ**[1] **/ qewax/:** ناو. قەواغ: ١. تێکوڵـی بەتاڵـی هێلکە و کوولەکە ٢. قاپۆڕ؛ پووکە ☰ ١. پوسـتەی توخالی ٢. پوکە

**قەواخ**[2]**:** ناوەڵناو. قەواغ؛ چـەماوە ‹پـیری کەفتـەکار قامـەت قـەواخم/ شـەریک مەینـەت ڕەفیـق ئـاخم «فولکلۆر»› ☰ خمیدە

**قەواد / qewad/:** نـاو. *[شوورەیی]* گـەواد؛ دەویـت؛ کەسێ کە ژنی داوێنپیس بۆ پیاوی ناپـاک سـاز دەکا ☰ جاکش

**قەوار / qewar/:** ناو. ١. کاکڵ؛ نـاوەرۆکی تێخـوڵ ٢. قوار؛ خۆڵەکەوەی پزیسکی تەندوور ☰ ١. مغـز میوە ٢. خاکستر تنور

**قەوارت / qewarit/:** ناو. ئەشکەوت ☰ غار

**قـەوارتن / qewartin/:** چـاوگ. قـەوارین؛ هەڵکڵۆشین؛ بە کۆڵین ناوەرۆک دەرهێنان ☰ با تیغ محتوای چیزی را بیرون آوردن

**قەوارۆک / qewarok/:** ناو. کاکڵی فەریکەگـوێز ☰ مغز گردوی دلمل

**قەوارووک / qewarûk/:** ☜ **قەوان ـ٣**

**قەوارە / qeware/:** ناو. ١. قەبارە؛ بارست ٢. پارچە بە ئەندازەی یەک دەست جلوبەرگ ‹دوو قـەوارە پارچە› ٣. لاتە؛ پارچە؛ بەشە زەوینی تایبـەت بـە ماڵێک ☰ ١. حجم ٢. قوارە ٣. قطعە

**قەوارین / qewarîn/:** ☜ **قەوارتن**

**قەواژ / qewaj/:** ☜ **قەلافەت**

**قەواستن / qewastin/:** چـاوگ. پلاژیـا کـردن؛ بەرهەمی هزر یا نووسینی کەسێک بە نـاوی خـۆ لە قەڵەم دان و بلاو کردنەوە ☰ سرقت ادبی کردن

**قەواش / qewaş/:** ناو. کەوگیر؛ کەوێر؛ کانزایـەکی کون ـ کونی دەسکدارە بۆ کەف گرتنی چێشـت و داکردنی پلاو بە کار دێ ☰ کفگیر

**قەواغ / qewağ/:** ☜ **قەواخ**

**قەواق / qewaq/:** ناو. هەوڕگەر؛ ئیربارکەر؛ مـرۆی کاسە و گۆزەکەر ☰ سُفالگر

**قەوال**[1] **/ qewal/:** ناو. ١. پیاوی ئایینی ئێزدی لە پایەی هەرە خواردا ٢. جۆرێ تفەنگی قـەدیمی ٣. شەبابە؛ جۆرێ بلوێر ☰ ١. روحانی دونپایـەی ایزدی ٢. نوعی تفنگ قدیمی ٣. نوعی نی نواختنی

**قەوال**[2]**:** ناوەڵناو. دەنگخۆش ☰ خوشآواز

**قەواڵ / qewał/:** نـاو. جۆرێ کرێ گرتنی زەمینی کشتوکاڵ ☰ نوعی اجارەی زمین کشاورزی

**قەواڵە / qewałe/:** ناو. ١. ☜ **قەباڵە** ٢. بابۆڵـە؛ نەواڵە؛ لەفە ☰ ١. ☜ **قەباڵە** ٢. ساندویچ

**قەوان / qewan/:** نـاو. ١. قـاوغ؛ پووکـە؛ قـاپۆڕەی فیشـەک ٢. گرامـافون؛ سـندووقی گـۆرانی ٣. قـەوارووک؛ سـێلک؛ سـەفحەی گرامـافۆن ٤.

چاوەگا؛ جۆرێ گوڵەبابوونە ☰ ١. پوکه ٢. گرامافون ٣. صفحەی گرامافون ۴. بابونەی گاوچشمی

**قەوانچە** / qewançe/: ئاوەڵناو. فڕێدراو؛ بۆ دوور ئاوێژراو ☰ پرت شده

⊡ **قەوانچە دان**: فڕێ دان ☰ پرت کردن

**قەوانە** / qewane/: ناو. گرام؛ گرامافۆن ☰ گرامافون

**قەوبڕ** / qewbiř/: ☜ **قەدبڕ**

**قەوتاندن** / qewtandin/: چاوگ. ١. دەرکردن؛ قەوراندن ٢. ئازاد کردن ☰ ١. بیرون کردن ٢. آزاد کردن

**قەوتە** / qewte/: ناو. ئاپوورە؛ حەشامات؛ کۆمەڵی زۆر لە مەردم ☰ تودەی مردم

**قەوتین** / qewtîn/: چاوگ. ١. دەرکران؛ قەوران ٢. بەردران؛ ئازاد کران ☰ ١. اخراج شدن ٢. آزاد شدن

**قەوچ** / qewç/: ئاوەڵناو. ١. دەمخوار؛ دەم لار ٢. /کینایە، پلار/ گەوج؛ گێلووکە؛ کەمفام؛ ناتێگەیشتوو ☰ ١. دهن‌کج ٢. ابله

**قەوچاندن** / qewçandin/: چاوگ. قەوچە کردن ☰ فک زدن

**قەوچاندنەوە** / qewçand(i)newe/: چاوگ. قەمچاندنەوە؛ چەماندنەوە؛ دووقەد کردنەوە؛ نووشتاندنەوە ☰ دولا کردن

**قەوچل**[1] / qewçil/: ناو. چڵم و ئاوی لووتی منداڵ ☰ آب بینی بچه

**قەوچل**[2]: ئاوەڵناو. ١. بێکارە؛ هیچلێنەهاتوو ٢. لەکارنەزان؛ نابەڵەد ٣. شپرێو؛ شپرزە ☰ ١. بیکاره ٢. ناشی ٣. نامرتب

**قەوچە**[1] / qewçe/: ناو. /ناشیرین/ قۆچە؛ کاری شەویلاکە جووڵاندن بە دەمی ئاوەڵاوە ☰ عمل فک زدن

⊡ **قەوچە کردن**: /ناشیرین/ ١. دەم جووڵاندنی ماکەر لە کاتی گاندا ٢. /پلار/ قسەی بێتام گوتن ☰ ١. دهن جنبانیدن ماده الاغ در حال جماع ٢. ژاژخاییدن

**قەوچە**[2]: ئاوەڵناو. سەرلێ شێواو؛ سەرگەردان ☰ سرگردان

⊡ **قەوچە بوون**: /کینایە/ دامان؛ سەرگەردانبوون ☰ سرگردان شدن

**قەوچە کردن**: /کینایە/ سەرگەردان کردن ☰ سرگردان کردن

**قەوچەر** / qewçer/: ناو. زەمیلە؛ زلینە؛ زەمبیل؛ قەوشەر ☰ زنبیل

**قەوچەقەوچ** / qewçeqewç/: ناو. /پلار/ کار یان ڕەوتی قسە کردنی زۆر و بێمانا ☰ ژاژخایی

**قەور** / qewr/: ناو. ١. قەبر؛ گۆڕ؛ گڵکۆ ٢. کاری دەرکردن؛ لە مل کردنەوە ☰ ١. قبر ٢. دک

⊡ **قەور هەڵتەکاندن**: /کینایە/ سەر ڕاست کردنەوە؛ زیندوو بوونەوە (ئەم سارستە وەکوو دوعا، کاتێ دەگوترێ کەسێکی لێهاتوو، بەتایبەت زۆردار، کارێکی لە هەموان نەهاتوو بکا) ‹ئەی یاخوا قەور هەڵتەکنی، ئەو تاشەبەردەت چۆن جووڵاند؟!› ☰ دوباره زنده شدن

**قەوران**[1] / qewran/: چاوگ. قەوتین؛ دەرکران؛ وەدەرنران ☰ رانده شدن

**قەوران**[2]: ☜ **قەبران**

**قەوراندن** / qewrandin/: چاوگ. قەوتاندن؛ دەرکردن؛ قاودان ☰ راندن؛ دک کردن

**قەورپشکنەک** / qewrpişk(i)nek/: ☜ **قوڕەبەشە**

**قەورخە** / qewrxe/: ☜ **قەبرخە**

**قەورسان** / qewrsan/: ☜ **قەبران**

**قەورکەن** / qewrken/: ☜ **قەبرهەڵکەن**

**قەورکەنە** / qewrkene/: ☜ **قوڕەبەشە**

**قەورکەنەک** / qewrkenek/: ناو. گۆڕکەنە؛ گۆڕپشکنەک ☰ گورکن

**قەورۆک / qewrok**/: ناو. کاکڵەگوێز و بادامە فەریکە ☰ مغز بادام و گردوی کال

**قەورە / qewre**/: ناو. بڕبەند؛ بڕوەن ☰ سوهان

**قەوز / qewz**/: ناو. ڕەسید؛ قەبز؛ پسوولەی حەساو ☰ قبض؛ رسید

**قەوزاخ / qewzax**/: ☜ **قۆزەقڕواق**

**قەوزاق / qewzaq**/: ☜ **قۆزەقڕواق**

**قەوزە / qewze**/: ناو. ١. قۆزە؛ قەوزەقورواق؛ کەژاو؛ جلەشینەی سەر ئاو ٢. کرێژە بەرد ☰ ١. خزە ٢. گُلسنگ

**قەوزەقورواق / qewzequrwaq**/: ☜ **قۆزەقڕواق**

**قەوزەقوڕباقە / qewzequřbaqe**/: ☜ **قۆزەقڕواق**

**قەوزیل / qewzîl**/: ئاوەڵناو. مردەلۆخ؛ مەڕمووکە؛ لەڕ و لاواز و بێهێز ☰ لاغرمُردنی

**قەوس / qews**/: ناو. سەرماوەز؛ ئاخر مانگی پاییز ☰ آذر ماه

**قەوساو / qewsaw**/: ناو. ئاودێریی باغ لە ئاخری پاییزدا، بۆ قڕکردنی پەتای باغ ☰ آبیاری باغ در آذرماه برای دفع آفات

**قەوسەل / qewsel**/: ناو. مەتەڵۆکە؛ مەتەڵ؛ چمامک ☰ چیستان

**قەوسەلە / qewsele**/: ناو. ١. قسەی بە زیپک ٢. قسەی بە هێما و ناڕاستەوخۆ ☰ ١. متلک ٢. ایما و اشاره

**قەوش / qewş**/: ناو. کلۆشی سەر خۆیان ☰ ساقەهای جمع‌آوری شدەی سر خرمن

**قەوشەر / qewşer**/: ☜ **قەوچەر**

**قەوغا**[1] / qewğa/: ناو. خێزانی زۆر لە ماڵدا ☰ خانوادەی پُرجمعیت

**قەوغا**[2]: ئاوەڵناو. ١. زۆر ئاوەدان؛ جێی سەردانی خەڵک ‹ئەو دوو جێگایە قەوغاترین دیوەخانی مەهاباد بوون «هێمن»› ٢. جەنجاڵ؛ پڕحەشامەت ‹نسحەتی دەکردم دەیگوت: ئەگەر تۆ لە سەر ئەم خیابانە قەوغایە دەسرەیەک ڕاخەی، لە سەد کەس یەکێک چوار فلسی بخاتە سەر، تا ئێوارە زۆرە «هەژار، *چێشتی مجێور*»› ☰ ١. آباد ٢. شلوغ

**قەول / qewl**/: ناو. قەوڵ؛ بەڵێن؛ پەیمان؛ شەرت؛ مەرج ☰ پیمان؛ عهد

⊡ **قەول (پێ) دان**: قەوڵ (پڵ) دان؛ بەڵێن (پێ) دان؛ گفت (پێ) دان ‹ئەو کچە لەو ماڵە قەولی داوە پێیم/ دەرک و دەروازەی داخراوە لێم «فولکلۆر»› ☰ قول دادن

**قەولک / qewlik**/: ناو. توورەکەی پچووکی وردە شت ☰ توبرەی خرت‌وپرت

**قەولوبڕ / qewl û biř**/: ناو. قەولوبڕی؛ قەرارداد؛ شەرت و پەیمان ☰ قول و قرار

**قەولوبڕی / qewl û b(i)řî**/: ☜ **قەولوبڕ**

**قەولەق / qewleq**/: ناو. قەولەک: ١. سورمەدان؛ کلدان ٢. توورەکەی چکۆلە ☰ ١. سُرمەدان ٢. توبرەی کوچک

**قەولەک / qewlek**/: ☜ **قەولەق**

**قەوڵ / qewł**/: ناو. بەڵێن؛ سۆز؛ پەیمان ☰ قول

⊡ **قەوڵ دان**: بەڵێن دان؛ بڕیار دان ☰ قول دادن

**بە قەوڵ کردن**: بە قسە کردن؛ بە گوێ کردن ☰ حرف (کسی را) گوش دادن

**قەوڵان / qewłan**/: ☜ **قەبلان**

**قەوڵاندن / qewłandin**/: چاوگ. قەوڵانن: ١. قەبلاندن؛ نرخاندن؛ خەملاندن ٢. فەوتاندن؛ شرت و گوم کردن ‹بردیان و سەریان قەوڵاند› ٣. *[شەرع]* سەرفیترە دان؛ زەکاتی تایبەتی مانگی ڕەمەزان دان ‹دوێنێ سەرفیترەکەم قەوڵاند› ☰ ١. ارزیابی کردن ٢. گم و گور کردن ٣. زکات فطریە را ادا کردن

**قەوڵانن / qewłanin**/: ☜ **قەوڵاندن**

**قەوڵدەر / qewłder**/: ناو. بەڵێندەر ☰ پیمانکار

**قەوڵنامە / qewłname**/: ناو. بەڵێن‌نامە؛ قەرارنامە؛

نووسراوەیەک کە دوو یان چەند لایەن لە سەری پێکهاتوون 🇮🇷 قولنامه

⊡ **قەوڵنامە کردن:** نووسین و واژۆکردنی قەوڵنامە 🇮🇷 قولنامه کردن

**قەوم** / qewm/: ناو. قۆم: ١. خزم؛ کەس‌وکار ٢. تیرە؛ ڕەگە 🇮🇷 ١. خویشاوند ٢. قوم؛ قبیله

**قەومار** / qewmar/: ناو. بەسەرهات و ڕووداوی ناخۆش و دڵتەزێن 🇮🇷 حادثەی دلخراش

**قەومان**[١] / qewman/: چاوگ. تێنەپەر. //قەومای؛ دەقەومێی؛ بقەومێ// قۆمان؛ قۆمیان؛ قۆمین؛ قەومیان؛ قەومین؛ قچان؛ ڕووداوی خراپ ڕوودان ‹لە پاش قەومانی شەهریوەر و هاتنی ڕووس بۆ مەڵبەندی موکریان ... «هەژار، چێشتی مجێور»› 🇮🇷 روی دادن (اتفاق ناگوار)

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: قەوماو/ چاوگی نەرێنی: نەقەومان

**قەومان**[٢]: ئاوەڵناو. پیر و زورهان؛ پیری لەکارکەوتە 🇮🇷 پیر از کار افتاده

**قەوماندن** / qewmandin/: چاوگ. تێپەر. //قەوماندت؛ دەقەومێنی؛ بقەومێنە// قۆمانن؛ قۆماندن؛ ئاژاوە، پشێوی و کارەسات نانەوە 🇮🇷 حادثه آفریدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ــــ/ چاوگی نەرێنی: نەقەوماندن

**قەوماو**[١] / qewmaw/: ناو. ڕووداوی ناخۆش 🇮🇷 حادثه؛ رویداد ناگوار

**قەوماو**[٢]: ئاوەڵناو. ڕووداو؛ سەرهەڵداو (زۆرتر بە باری ناخۆشەوە) ‹هەڵس‌وکەوتی قەوماو دڵی خەڵکی تەزاند› 🇮🇷 رویداده (ناگوار)

**قەومایەتی** / qewmayetî/: ناو. نەتەوایەتی؛ نیشتمانەتی 🇮🇷 ملیّتی

**قەومخۆشەویست** / qewmxoşewîst/: ئاوەڵناو. خزمدۆست 🇮🇷 قوم‌دوست

**قەومک** / qewmik/: ناو. کەدوو سەراوی؛ کوولەکە سەراوی 🇮🇷 کدو حلوایی

**قەوموخوێش** / qewm û x(i)wêş/: ناو. قەوموقیلە؛ قەوموقنگەزە؛ خزم و کەس 🇮🇷 قوم و فامیل

**قەوموقنگەزە** / qewmûqingeze/: ☜ قەوموخوێش

**قەوموقیلە** / qewm û qîle/: ☜ قەوموخوێش

**قەومە** / qewme/: ناو. قۆمە؛ ڕووداوی ناخۆش 🇮🇷 پیشامد ناگوار؛ حادثه

**قەومی**[١] / qewmî/: ناو. خزمی؛ خزمایەتی 🇮🇷 خویشاوندی

**قەومی**[٢]: ئاوەڵناو. ڕەچەڵەکی؛ گەلی 🇮🇷 ملّی

**قەومیان** / qewm(i)yan/: ☜ قەومان[١]

**قەومین** / qewmîn/: ☜ قەومان[١]

**قەوە** / qewe/: ☜ قەوەت[١]

**قەوەت**[١] / qewet/: ناو. قەوە؛ هێز؛ توانایی؛ گوڕ ‹تالیبی ڕاهی حیجازم، لە موخالیف هەڵدەن!/ بێ نەوا قەلبی حەزینم قەوەتی بەندی نییە «نالی»› 🇮🇷 قوّت

⊡ **قەوەت نەبون:** حەوسەلە نەبوون 🇮🇷 حوصله نداشتن

**قەوەت**[٢]: دوعا. ئۆخەی؛ وشەیەک بۆ ڕاگەیاندنی دڵخۆشی ‹قەوەت! دە وەرە لام› 🇮🇷 آخیش؛ کلمەی نشاط و اشتیاق

**قەوەتپێشکاو** / qewetpêş(i)kaw/: ئاوەڵناو. چی؛ زاڵ 🇮🇷 چیره

**قەوەزەڵ** / qewzeł/: ئاوەڵناو. لەڕ و داڵگۆشت 🇮🇷 لاغرمُردنی

**قەوی** / qewî/: ئاوەڵناو. قەوین: ١. ئەستوور ‹مل قەوی› ٢. بەتاقەت ٣. دەسەڵاتدار ٤. ساغ و دروست ٥. خورت؛ بەهێز ٦. فریە؛ فرە؛ گەلەگ 🇮🇷 ١. ستبر ٢. باتحمل ٣. بانفوذ ۴. صحیح و سالم ۵. نیرومند ۶. فراوان

**قەویت** / qewît/: ناو. ١. سەرپەرشتی خێزانی

مردوو ٢. ڕاسپێر؛ ئەوە شتێ ڕادەسپێرێ ≡ ١. قیم ٢. سفارش‌کننده

**قەویتی / qewîtî**/: ناو. ١. سەرپەرشتی ٢. قەوینتی؛ ڕاسپێری ≡ ١. قیمومت ٢. سفارش

**قەویل / qewîl**/: ☜ قەبوڵ

**قەویلە[1] / qewîle**/: ☜ قەبیلە

**قەویلە[2]**: ئاوەڵناو. خڕی قوڵەی قەڵەو ≡ چاقالوو

**قەوین / qewîn**/: ☜ قەوی

**قەوینتی / qewîntî**/: ناو. قەویتی؛ ڕاسپێری ≡ سفارش

**قەوینتیکری / qewîntîk(i)rî**/: ناو. ئەسپاردە؛ ئەسپەردە ≡ سپرده

**قەوینتیکەر / qewîntîker**/: ناو. ڕاسپێر؛ ئەو کەسەی ڕادەسپێرێ ≡ سفارش‌کننده

**قەهبک / qehbik**/: ☜ قاحبە

**قەهوە / qehwe**/: ☜ قاوە

**قەهێکەر / qehêker**/: ئاوەڵناو. گەوج؛ نەفام ≡ ابله

**قەی[1] / qey**/: ناو. ١. ☜ قەد[1] ٢. قەید؛ عەیب؛ ئیراد ‹قەی نییە› ٣. هێق؛ هەراش؛ ڕەوتی ڕشانەوە ‹قەی منالی شیرەخۆر پیس نییە› ≡ ١. ☜ قەد[1] ٢. ایراد؛ نقص ٣. قی

⊡ **قەی کردن**: گونجاو نەبوون ≡ اشکال داشتن

**قەی کردنەوە**: هێنانەوە؛ ڕشانەوە ‹شیرەکەی قەی کردەو› ≡ قی کردن؛ بالا آوردن

**قەی نەبون**: ☜ قەی نەکردن

**قەی نەکردن**: قەی نەبوون؛ گونجاو بوون ‹قەی ناکا منیش بێم؟› ≡ اشکال نداشتن

**قەی[2]**: دەنگ. ئەدی؛ بەڵێ؛ هۆبەڵێ ≡ بلی

**قەی[3]**: ئامراز. ١. بۆ؛ بۆچی ٢. کەوایە؛ کەوابوو ≡ ١. چرا ٢. که اینطور

**قەیاخ / qeyax**/: ناو. قەیاغ: ١. گیایەکە ٢. بەلەمی پان و زل بۆ بار بردن و پەڕینەوە ≡ ١. گیاهی است ٢. قایق باربری

**قەیاخەڕیخە / qeyaxeřîxe**/: ناو. جۆرێک قەیاخی گەلاورد و باریک کە بۆ دوورینەوە نابێ ≡ گیاهی است

**قەیاخەوان / qeyaxewan**/: ☜ قایەقەوان

**قەیار / qeyar**/: ناو. ١. نینۆکی درێژی یەکسم کە ئەیتاشن ٢. بنە/ پنجەگیا ٣. قەراغ؛ کەنار ٤. پنجی درزی دیزە و گۆزە ≡ ١. ناخن مانند تراشیدنی ستور ٢. بوتەی گیاه ٣. کنار؛ گوشە ۴. چسب درز ظرف سُفالین

**قەیارە / qeyare**/: ☜ قەدارە

**قەیاسە / qeyase**/: ناو. سەرقۆش؛ باربەندی پان لە چەرم ≡ باربند پهن چرمی

**قەیاغ / qeyağ**/: ☜ قەیاخ

**قەیبڕ / qeybiř**/: ☜ قەدبڕ

**قەیبە / qeybe**/: ئاوەڵناو. قەیبەبڕ؛ قەدبڕ؛ لابڕ؛ سەربڕ ≡ میانبُر

**قەیبەبڕ / qeybebiř**/: ☜ قەیبە

**قەیپەڕۆشە / qeypeřoşe**/: ناو. هێق؛ ڕەوتی ڕشانەوە ≡ قی

**قەیتان / qeytan**/: ناو. شەهبەن؛ بەنۆک؛ پەتک؛ هەودای ناسک و باریکی هۆنراو لە ڕیشاڵە بەتایبەت هاورێشم ≡ قیطان

**قەیتاندار / qeytandar**/: ☜ قەیتانی ـ٣

**قەیتانی / qeytanî**/: ئاوەڵناو. ١. لە جنسی قەیتان ‹بەنی قەیتانی› ٢. باریک وەک قەیتان ‹سمێڵی قەیتانی› ٣. قەیتاندار؛ بە قەیتانەوە ‹کەوشی قەیتانی› ≡ ١تا٣. قیطانی

**قەیتول / qeytul**/: ناو. خونچە؛ غونچە ≡ غُنچە

**قەیتوڵ / qeytûl**/: ناو. ١. لەشکرگە؛ شوێنی دامەزرانی لەشکر ٢. گوڵووک؛ گوڵدەم؛ خونچە ‹چوون باخچەی خانان قەیتووڵ وناران/ دەستە بە دەستە چوون زوڵف یاران «بێسارانی»› ≡ ١. لشکرگاه ٢. غُنچە

**قـەیتـەر / qeyter**/: نـاو. ١. قەیســـەر؛ نازنـــاوی هێندێک لە پاتشایانی ڕۆم ٢. *[کینایە]* دەسەلاتدار؛ خاوەن هێزی سیاسی ▬ ١. قیصر ٢. صاحب قدرت

**قەیتەران / qeyteran**/: نـاو. ڕووەکێکـی کولـکنی یەکسالەیە لە تـەڕەتیزە دەچـێ لاسـکەکانی لـە سەر زەوی ڕادەکشێن و بۆنێکی پیسی هەیە، پتر لـە نیـو میتـر بـالا ناکـا، گولـی سـوور، سـپی، ئەرخەوانی و پەمەیی دەکا، زۆرتر لە شوێنی بایەر دەڕوێ ▬ نُک لکلکی هرزه

**قـەیتەرقـو / qeyterqû**/: ئاوەلـناو. دەســـتەئەژنۆ؛ چارەنووس نادیار ▬ بلاتکلیف

**قەیچۆڵ / qeyçoł**/: ئاوەلـناو. دەمهـەپک؛ بـێددان ▬ بی‌دندان

**قەیچی / qeyçî**/: نـاو. قاچی؛ تۆرتۆر؛ مەقەسـت ▬ قیچی

◘ **قەیچی کردن**: پـەرتاوتن بـە قـەیچی ▬ قیچـی کردن

**قەیچی‌بڕ / qeyçîbiř**/: نـاو. کاری بە تۆرتۆ بڕین ▬ قیچی‌بُر

**قەیچی . قەیچی / qeyçî qeyçî**/: نـاو. حینـدرحۆ؛ هەلەق‌مەلەق؛ حەقلی‌مەقۆ؛ یارییەکی مندالانە ▬ الاکُلنگ

**قەیچی‌کراو / qeyçîk(i)raw**/: ئاوەلناو. هەڵـپاچراو؛ کوڕ ▬ بریده با قیچی

**قەید / qeyd**/: نـاو. ١. قەی؛ قیـد؛ عـەیب و مـانع ‹دنیا کە گولگولی بووە، قوربان ئـەتۆش وەرە/ تالیـب بە گوڵ بە، قەیدی چییە گوڵ، گوڵی بوێ؟! «نـالی»› ٢. ئالقەی ئاسن ٣. کاری ئالقە گوریسی تا بار بە تا بارەوە دان ٤. قەیدک؛ گە؛ جومگـەی یەکسـم ٥. هەوای گۆرانی ٦. *[ڕێزمان]* ئاوەلکار؛ ئاوەلکردار ▬ ١. ایراد؛ اشکال ٢. حلقەی آهنی ٣. عمل ریسـمان حلقه شده را به لنگه بار چسبانیدن ٤. مُـچ سـتور ٥. آهنگِ ترانه ٦. قید

**قەیدک / qeydik**/: نـاو. ١. قەیـد؛ گـە؛ جومگـەی یەکسـم ٢. زنجـیری پـەل‌بەنـدی یەکسـم ٣. پەراوێز؛ نووسراوەی دەور و ژێـری پـەڕاو ▬ ١. مُچ ستور ٢. زنجیر پای ستور ٣. حاشیه

**قەیدێ / qeydê**/: ئاوەلـکار. قەیرێ؛ ماوەیـەک لـە زەمان ‹قەیدێ با وا بێ، بـەلام ڕۆژی ئـەبێ مندالـی کورد «حەمدی»› ▬ مُدتی

**قەیر / qeyr**/: ناو. ئەندازە؛ قەدەر ▬ اندازه؛ قدر

**قەیران / qeyran**/: نـاو. ١. بەلێن بۆ کـات دیـاری کردن ‹قەیرانـمان سەری مانگ بـێ› ٢. جەنگـەی توند و تیژی نەخۆشی ‹ئـەم نەخۆشـییە چـوار ڕۆژ قەیرانـــییەتیان› ٣. ئەو پەڕی کارەڕەهاتێک کە بە دوویدا گۆڕانکاری دەبێ ‹قەیرانـی سیاسـی› ▬ ١. موعد ٢. بُحران بیماری ٣. بُحران

**قـەیرمـەزان / qeyrmezan**/: ئاوەلـناو. ناســـپاس؛ سپلە؛ سفلە ▬ قدرنشناس

**قەیرە[١] / qeyre**/: ناو. قەدرە؛ بەرانی پێـنج سـالان ▬ قوچ پنج ساله

**قەیرە[٢]**: ئاوەلناو. قەدرە: ١. بەتەمەن‌تر لە جەنگەی جوانی و لاوەتی ‹مندال نییە، پیاوێکی قەیرەیە› ٢. تایبەتمەنـــدی عـــەزەبێ کـــە لـــە وەخـــتی هاوسەرگیریی لای داوە ‹کچەکەیان قەیرەیـە› ٣. لەکاردەرهاتوو ‹ئەسپێکی قەیرەیە› ▬ ١. مسن تـر از عنفوان جوانی ٢. تُرشیده ٣. آزموده

**قەیرە .[٣]**: پێشوشە. گـەورە؛ لـە جەنگـەی تایبـەت تێپەڕیو ‹قەیرەکچ؛ قەیرەپیاو› ▬ رشید

**قەیرێ / qeyrê**/: ئاوەلـکار. قـەدرێک؛ فرەیـەک؛ ماوەیەکی زۆر ‹فریشتەیێ لە ئاسمانەوە هاتە خـوار، قەیرێ لەگەلمانا گریا و ئینجا ڕۆیشـتەوە بـۆ ئاسمـان «شێرکۆ»› ▬ مُدتی

**قـەیسک / qeysik**/: نـاو. ١. عاسـا؛ داروەکـاز ٢. مشتووی خەنجەر و دەسکی شـیر ٣. بـاگردێن؛ بانگلێر ▬ ١. عصـا ٢. دسـتەی شمشـیر و خنجـر ٣.

بامغلتان

**قەیسەر** / qeyser/: ناو. ١. تەز؛ قوفل؛ قەفل؛ سرِی لە سەرما ٢. شەختە؛ سەرما و سۆڵەی پاییز ٣. قەیتەر؛ نازناوی کەونارای برِێ لە میرمەزنانی ئەورووپا، بەتایبەت پاشای رۆم ☰ ١. کرخی از سرما ٢. سرمای پاییزی ٣. قیصر

◻ **قەیسەر بون:** ☜ **قەرسان**

**قەیسەربردو** / qeyserbirdû/: ناوەڵناو. شەختەلێداو؛ سەرمابردوو ☰ سرمازده

**قەیسەرقو** / qeyserqû/: ناو. چاوەنوارِی زیاد ☰ انتظار بسیار

**قەیسەری** / qeyserî/: ناو. راستەبازار؛ گوزەر ‹قەیسەری لێ بۆتە کونە مشک! «مەسەل»› ☰ راستەبازار

**قەیسەکوژ** / qeysekuj/: ناو. درِێڵە؛ درِێڵەباخی ☰ ترتیزک چمنی

**قەیسەکوژە** / qeysekuje/: ناو. درەیلە؛ درِێلە؛ رووەکێکە لە بنەماڵەی شەوبۆ، تا ٢٠ سانتیمیتر بالا دەکا و گوڵی رەنگین و بەرێکی فندقی و بچووک دەگرێ ☰ کاردامین چمنی

**قەیسی** / qeysî/: ناو. ١. شێلانە؛ زەردالوو ٢. دەنکەخۆشەی زەردالوو ٣. لەتکراوی وشکەوەبووی شێلانە ☰ ١. زردالو ٢. هستەی شیرین زردالو ٣. قیسی

**قەیسیل** / qeysîl/: ☜ **قەرسیل**

**قەیسیورۆن** / qeysî w řon/: ناو. خواردنێکە لە لەتکەی قەیسی و رۆن و شەکر ☰ از خورش‌ها

**قەیش** / qeyş/: ناو. قایش؛ بەندی چەرمی ☰ قیش

**قەیغان** / qeyğan/: ناوەڵناو. ئازا؛ بەجەرگ ☰ دلیر

**قەیفە** / qeyfe/: ☜ **قەدیفە**

**قەیفەپۆش** / qeyfepoş/: ناو. قەدیفەپۆش ‹گیا وردەی پایز سەوزی نەرم و نۆڵ/ قەیفەپۆشی رووی تەختی خاک و خۆڵ «گۆران»› ☰ مخمل‌پوش

**قەیفەیی** / qeyfeyî/: ناوەڵناو. سوورکاڵ؛ بە رەنگی ئاڵ ☰ قرمز روشن

**قەیقەناخ** / qeyqenax/: ناو. هێلکەورۆنی بە دۆشاو؛ خاورۆنی بە شۆک ☰ خاگینە با شیرەی انگور

**قەیک** / qeyk/: ☜ **قایەق**

**قەیل**[1] / qeyl/: ناو. سەرعێل؛ گەورەی هۆز ☰ سردار ایل

**قەیل**[2]: ناوەڵناو. بلند؛ بەرز ☰ بُلند

**قەیلۆک** / qeylok/: ناو. داوەڵ؛ داهۆڵ ☰ مترسک

**قەیلە** / qeyle/: ناو. قاورمە؛ گۆشتی وشکەوبوو لە هەمانەدا بۆ زستان ☰ قورمه

**قەیم** / qeyim/: ناو. قەدیم؛ پێشوونە ☰ قدیم

**قەیم** / qeym/: ناوەڵناو. قایم؛ سفت توند ☰ مُحکم

**قەیماخ** / qeymax/: ناو. قەیماغ: ١. تۆژگ؛ توێژی سەر ماست و شیر ٢. میوانی؛ ئارد و رۆنی سوورەوەکراو ☰ ١. لایەی چربی روی ماست و شیر ٢. کاچی

**قەیماغ** / qeymağ/: ☜ **قەیماخ**

**قەیمی** / qeymî/: ☜ **قەدیمی**

**قەیمین** / qeymîn/: چاوگ. رەق بوونی ئەندامی لەش ☰ سفت و سخت شدن اندام

**قەینات** / qeynat/: ☜ **قنیات**

**قەیناخ** / qeynax/: ناو. گیایەکە ☰ گیاهی است

**قەیناغ** / qeynağ/: ناو. قامکەوانە؛ قامکە دەسکێشی چەرمی دروێنەوانان ☰ انگشت‌پوش چرمی دروگران

**قەینتر** / qeyntir/: ☜ **قەمتەرە ـ١**

**قەینە** / qeyne/: ئامراز. مەگەرنە؛ مەگین وا نییە ☰ مگر نه

**قەییم** / qeyîm/: ناوەڵکار. لە کۆندا؛ لە سەردەمانی

پێشوودا ‹خزمایەتی قەییم وا نەو› ▤ قدیم قدیمها

**قەییمی** / qeyîmî/: ☜ **قەدیمی**

**قیا** / q(i)ya/: ☜ **قیامەت**

**قیافە** / q(i)yafe/: ☜ **قەلافەت**

**قیامەت** / q(i)yamet/: ناو. حەشر؛ قیا: ١. سەلا؛ پەسلان؛ ژیانەوەی دوای مەرگ ٢. *[کینایە]* حەشر و حەلەلا؛ قەرەبالغی و سەرلێشێواوی خەلک ▤ ١و٢. قیامت

**قیبتی** / qîbtî/: ناو. ١. نەتەوەی دانیشتووی کەونارای ولاتی میسر ٢. هەرکام لە خەلکی ئەو نەتەوە ٣. لە زمانگەلی حامی، زمانی کەونارای میسر ▤ ١تا٣. قبطی

**قیبلە** / qîble/: ناو. قوبلە؛ قوبلە؛ کیبلە؛ ڕووگە ▤ قبله

**قیبلەنما** / qîblen(i)ma/: ☜ **قیبلەنوما**

**قیبلەنوما** / qîblenuma/: ناو. قیبلەنما؛ قیبلەنوێن؛ ئامرازی نیشاندانی لای کەعبە ‹قیبلەم هەر شارێ تۆ مەکەری جێت/ چوون قیبلەنوما ڕوو مەکەران لێت «ئەحمەد بەگی کۆماسی»› ▤ قبلەنما

**قیبلەنوێن** / qîblen(i)wên/: ☜ **قیبلەنوما**

**قیپ**[1] / qîp/: ناو. ١. لاسکی ئەستوور ٢. بەلەکی پا ▤ ١. ساقەی کلفت ٢. ساق پا

**قیپ**[2]: ئاوەلناو. ١. بەلەکئەستوور ٢. لەڕ و لاواز ▤ ١. ساق‌کلفت ٢. لاغر

⊡ **قیپ بوون**: لەڕ بوونەوە؛ گۆشتی لەش کەم کردن ▤ لاغر شدن

**قیپتی** / qîptî/: ئاوەلناو. سڵ و شەرمێون ▤ خجالتی

**قیت**[1] / qît/: ناو. ١. ڕۆنێ کە شوانکارە دەیدا بە خاوەن‌پەز ٢. پاژێکی بچووک لە برشتی دار بە تەور ٣. لقی دار ▤ ١. روغنی کە شبان بە گلەدار می‌دهد ٢. تراشەی کوچک چوب ٣. شاخەی درخت

**قیت**[2]: ئاوەلناو. قیتە: ١. قنج؛ بلند و ڕاست؛ ڕاست‌ڕاوەستاو ٢. زۆپ؛ زەق ٣. خێل؛ خوێل؛ چاولار ▤ ١. راست؛ قائم ٢. برآمده؛ برجسته ٣. لوچ

**قیتایی** / qîtayî/: ناو. میت؛ زەقایی ▤ برجستگی

**قیتک** / qîtik/: ناو. ١. *[شووروەیی]* قیتکە؛ بەلۆکە؛ میتکە ٢. کەشکەک؛ کەشکەزرانی ٣. لقی بچووکی دار؛ لقی ناسک ▤ ١. چوچوله ٢. کاسەی زانو ٣. شاخەی نازک درخت

**قیتکە**[1] / qîtke/: ناو. *[شووروەیی]* قیتک؛ بەلۆکە ▤ چوچوله

**قیتکە**[2]: ئاوەلناو. زۆپی بچووک ▤ اندکی برآمده

**قیت‌وقۆز** / qît û qoz/: ئاوەلناو. بەژن‌ڕاستی جوانچاک ‹گوێم دەیە ئەی دیدەمەستی قیت‌وقۆز/ تا بنالێنم وەکوو بلوێر بەسۆز «هێمن»› ▤ بلندبالای خوش‌تیپ

**قیتە** / qîte/: ئاوەلناو. ١. ☜ **قیت**[2] ٢. تایبەتمەندی حەیوانێ کە هەر دوو شاخی ڕاست هەلچووە ▤ ١. ☜ **قیت**[2] ٢. ویژگی حیوانی کە شاخ‌های راست و عمودی دارد

**قیتەقیت**[1] / qîteqît/: ناو. *[کینایە]* جحێلایەتی؛ هات‌وچۆ بۆ حەز و ڕابواردن ‹چل تیکەی مەرەز بۆ کێ لە بەر کەم؟/ لە بەر ماڵ کیا هەر قیتەقیت کەم؟ «فولکلۆر»› ▤ ورجەوورجەی عاشقانە

**قیتەقیت**[2]: ئاوەلکار. بە قنجی؛ بە بالای ڕاست و قیتەوە ‹وەیزانی ناوی ئەویان خوێندەوە، قیتەقیت چووە ناوەوە› ▤ راست‌راست

**قیتەڵ** / qîteɫ/: ئاوەلناو. چکۆلەی زەق و زۆپ ▤ کوچولوی سرزندە

**قیتی** / qîtî/: ☜ **قۆزایی**

**قیچ**[1] / qîç/: ناو. کیژ؛ کەنیشک ▤ دختر

**قیچ**[2]: ئاوەلناو. ١. تایبەتمەندی کەسێ کە چاوێکی پچووکترە ‹پێم دەڵێن: مەحبووبە خێل و قیچە،

مەیلی شەڕ دەکا/ خێل و قیچە یا تەرازووی نازی نەختێ سەر دەکا؟! «نالی»› ٢. قووچ؛ بڵندی کەلەقەندی ٣. خوار، خێچ ٤. سپی زۆر سپی ٥. پیچ؛ کەموسکە ☰ ١. ویژگی کسی کە یکی از چشمانش کوچکتر است ٢. بلند مخروطی ٣. کج ۴. بسیار سفید ۵. اندک

⊡ **قیچ کردنەوە**: ١. چاوێک قووچاندن و بە چاوێک ڕوانین ٢. لە دوورەوە بڵند هاتنە بەرچاو ☰ ١. چشمی را بستن و با چشم دیگر نگاە کردن ٢. از دور بلند بە نظر رسیدن

**قیچک / qîçik**/: ناو. ١. *[شوورەیی]* قیتکە؛ بەلۆکە ٢. زەردی ئاچوخ ☰ ١. چوچولە ٢. زرد روشن

**قیچمەز / qîçmez**/: ئاوەڵناو. *[پلار]* قیچمەس: ١. ئابڕووتکاو؛ بێشەرم ٢. ئاکارخراپ ☰ ١. بی‌آبرو ٢. بدرفتار

**قیچمەس / qîçmes**/: ☜ قیچمەز

**قیچەڵپاچ / qîçełpaç**/: ☜ قیلەوقاچ

**قیچەڵفاچ / qîçełfaç**/: ☜ قیلەوقاچ

**قیچەڵقاچ / qîçełqaç**/: ☜ قیلەوقاچ

**قید / qîd**/: ☜ قەید ـ١

▣ **قید نینە**: قەیدی نییە؛ قەی ناکا ☰ اشکالی ندارد

**قیر / qîr**/: ناو. قیل؛ ماکێکی ڕەشی نیوەتراو لە هیدرۆکەربون کە لە گەرمادا دەتوێتەوە و لە پاڵاوتنی نەوت بەرهەم دێ ☰ قیر

**قیرا / qîra**/: ناو. بوولێڵە؛ بەرەبەیان ☰ بامداد

**قیرات / qîrat**/: ناو. ١. یەکەی کێش بۆ کێشانی بەردی گرانبایی، بەرانبەر بە ٢/٠ی گرەمێک ٢. گەرماپێو؛ ئامرازی شاندانی پلەی گەرما و سەرما ☰ ١. قیراط ٢. دماسنج

**قیراچ / qîraç**/: ناو. ١. پەراوێزی نووسراو ٢. قژی ئاڵۆز ☰ ١. حاشیەی نوشتە ٢. موی ژولیدە

**قیراخ / qîrax**/: ناو. دەلینگ یان قۆڵ هەڵماڵیو ☰ آستین یا پاچە بالا زدە

**قیراوی / qîrawî**/: ئاوەڵناو. قیلاوی؛ لە قیردا گەوزاو ☰ قیری

**قیرپاچ / qîrpaç**/: ناو. قورپاچ؛ قەمچی؛ قامچی؛ تازیانە؛ شەلاخ ☰ تازیانە

**قیرتاو[1] / qîrtaw**/: ناو. قیرەتاو؛ قیلەتاو؛ قیلتاو؛ ئیسفاڵت ☰ آسفالت

**قیرتاو[2]**: ئاوەڵناو. قیرەتاو؛ قیلەتاو؛ قیرتێدراو؛ قیلتاو؛ قیرناو؛ داپۆشراو بە توێژێک قیر ‹بانی قیرتاو› ☰ قیراندود

**قیرتەبەق / qîrtebeq**/: ناو. جۆرێ نانەشانی لە تووڵ‌تەنراوی قیلەتاو کراوە ☰ سبد قیراندود

**قیرتێدراو / qîrtêd(i)raw**/: ☜ قیرتاو[2]

**قیرسز / qîrsiz**/: ئاوەڵناو. *[پلار]* ڕژد؛ چکووس ☰ خسیس

**قیرسیچم / qîrsîçm**/: ☜ قیرسیچمە

**قیرسیچمە / qîrsîçme**/: ☜ قیرسیچمە

**قیرقاج / qîrqac**/: ☜ قیلەوقاچ

**قیرقاچ / qîrqaç**/: ☜ قیلەوقاچ

**قیرگونی / qîrgûnî**/: ☜ قیروگۆنی

**قیرناو / qîrnaw**/: ☜ قیرتاو[2]

**قیروسیا[1] / qîr û s(i)ya**/: ئاوەڵناو. قیڕوسیا؛ بێبایەخ؛ ناقابیل ‹زوڵفی جەڕڕاری سەفاسەف خستە پێش/ یەعنی زەنگی لەشکری قیروسیان «نالی»› ☰ بی‌ارزش

**قیروسیا[2]**: دوعا. قیڕوسیا؛ هەر چی ئەبێ با ببێ ‹حاجی تووتنەکەت مادەم فرۆشرا/ قیروسیا لە سەد کوشتن و هەرا «بێکەس»› ☰ هرچە بادا باد

**قیروقاج / qîr û qac**/: ☜ قیلەوقاچ

**قیروقاچ / qîr û qaç**/: ☜ قیلەوقاچ

**قیروگۆنی / qîr û gonî**/: ناو. قیرەگۆنی؛ قیروگوونی؛ قیرگوونی؛ گۆنی ڕاخراوی قیری داخ بە سەردا کراو، بۆ پاراستنی خانووبەرە لە نم و تەڕایی ☰ قیرگونی

**قیروگونی** / qîr û gûnî/: ☜ **قیروگۆنی**

**قیرەتاو** / qîretaw/: ☜ **قیرتاو**

**قیرەگۆنی** / qîregonî/: ☜ **قیروگۆنی**

**قیری**[1] / qîrî/: ناو. قیرین؛ ڕەش ☰ قیری؛ مشکی

**قیری**[2]: ئاوەڵناو. قیرین: ١. چێ کراو لە قیر ‹سەربانی قیری› ٢. قیر پێوە تلاو ‹دەستی قیری› ٣. ڕەش؛ بە ڕەنگی قیر ‹باڵتەی قیری› ☰ ١تا٣. قیری

**قیرین** / qîrîn/: ☜ **قیری**

**قیرینە** / qîrîne/: ئاوەڵناو. قیرتێ‌هەڵسواو؛ بە قیر داپۆشراو ☰ قیراندود

**قیڕ**[1] / qîř/: ناو. پڕتاو؛ چوارناڵە ☰ چهارنعل

**قیڕ**[2]: ئاوەڵکار. لەنەکاو بێ‌دەنگ و سەدا ‹قیڕ دەنگی هەڵدا› ☰ ناگهان بی‌سروصدا

**قیڕات** / qîřat/: ناو. ١. دوو لە دەی گرەمێک؛ یەکەی کێش بۆ کێشانی بەردی گرانبایی بەرانبەر بە ٢/٠ گرەم ٢. گەرماپێو؛ ئامرازێکە جیوەی تێدا، دەگەڵ گەرما بەرز دەبێتەوە و دەگەڵ سەرما دادەکشێ ☰ ١. قیراط ٢. دماسنج

**قیڕاندن** / qîřandin/: چاوگ. تێپەڕ. //قیڕاندت؛ دەقیڕێنی؛ بقیڕێنە// قیڕانن؛ قیڕە کردن ‹چی ما نەیکەم؟/ پێیان وتم: شین بە! شین بووم/ زەرد بە! زەرد بووم/ .../ بقیڕێنە! قیڕ، قیڕاندم «پەشێو»› ☰ فریاد زدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەقیڕاندن

**قیڕانن** / qîřanin/: ☜ **قیڕاندن**

**قیڕچین** / qîřçîn/: ☜ **قیڕچان**

**قیڕسیچم** / qîřsîçm/: ☜ **قیڕسیچمە**

**قیڕسیچمە** / qîřsîçme/: ئاوەڵناو. قیڕسیچم؛ قیرسیچم؛ قیرسیچمە: ١. پێ‌چەقێن؛ نەساز؛ لاسار ٢. ڕژد؛ چکووس ☰ ١. لجباز ٢. خسیس

**قیڕقیڕ** / qîřqîř/: ناو. قیڕەقیڕ؛ هەرا و زەنا ـ زەنا ‹کوڕۆ! ئەو چ قیڕقیڕا تەیە؟› ☰ غوغا و جنجال

**قیڕوسیا** / qîř û s(i)ya/: ☜ **قیروسیا**

**قیڕوقاڕ** / qîř û qař/: ☜ **قیڕوقاڵ**

**قیڕوقاڵ** / qîř û qał/: دەنگەناو. قیڕوقاڕ؛ هەرا و هوریا؛ زەنا ـ زەنا ☰ دادوقال

**قیڕوهۆڕ** / qîř û hoř/: دەنگەناو. قیڕەوهەرا؛ گرمومەقاڵ؛ قرموقاڵ ☰ دادو هوار

**قیڕە**[1] / qîře/: ناو. ١. ڕەوتی کەوتنی دەنگ لە زیقەدا ٢. هەرا؛ هاوار ☰ ١. گرفتگی صدا از جیغ زیاد ٢. داد؛ فریاد

⊡ **قیڕە بوون**: دەنگ کەوتن لە بەر زیقاندن ☰ گرفتن صدا از جیغ زیاد

**قیڕە**[2]: دەنگەناو. ١. قڕەی بۆق ٢. زیقەی باڵدار ☰ ١. صدای قورباغه ٢. جیغ پرنده

**قیڕەقیر** / qîřeqîr/: ناو. هەراهەرا؛ قاوەقاو ☰ سروصدا

**قیڕەقیڕ** / qîřeqîř/: دەنگەناو. زیقە و هەرای زۆر ☰ جیغ و فریاد زیاد

**قیڕەوین** / qîřewin/: ئاوەڵناو. چەقەکەر لە مامەڵەدا ☰ چانەزن در معامله

**قیڕین** / qîřîn/: چاوگ. زیقاندن؛ قیژاندن ☰ جیغ کشیدن

**قیز** / qîz/: ناو. ١. کچ؛ دۆت؛ قز ٢. قێز؛ بێز ☰ ١. دختر ٢. چندش؛ بیزاری و حالت تهوع از دیدن چیزی

⊡ **قیز شێوان**: قیز شێویان/ شێویانەوە؛ بێز هاتنەوە ☰ چندش آمدن

**قیز شێویان/ شێویانەوە**: ☜ **قیز شێوان**

**قیز کردن**: قیز کردنەوە؛ بێز کردن ☰ چندش شدن

**قیز کردنەوە**: ☜ **قیز کردن**

**قیز لێ‌کردن**: ☜ **قیز لێ‌هاتن**

**قیز لێ هاتن**: قیز لێ کردن؛ بێز لێ کردن ☰ چندش شدن

**قیزا** / qîza/: ناو. کچ؛ کیژ؛ کەنیشک ☰ دختر

**قیزک** / qîzik/: ناو. دارێکی لێڕەوارە ☰ درختی جنگلی

**قیزنای** / qîznay/: چاوگ. قیز شێواندن ☰ چندش آوردن

**قیزوبیز** / qîz û bîz/: ناو. قێزوبێز؛ قێزووێز؛ ڕەوتی قیز کردنەوە ☰ چگونگی دل به هم آمدن

**قیزۆک** / qîzok/: ناو. پووکاولە؛ چەمۆلە؛ چەمبۆلە ☰ عمل ام کردن؛ پنجه گذاشتن

**قیزەوشێوێن** / qîzewşêwên/: ناوەڵناو. قیزهەڵشێوێن؛ بێزەوەر؛ بێزهێنەر ☰ مُهوِّع

**قیزەون** / qîzewin/: ناوەڵناو. قێزەون: ١. ئیتریس؛ تایبەتمەندی شتێ کە مرۆ بێزی لێ دەکا ٢. دژخۆر؛ تایبەتمەندی مرۆی بەبێز کە کەم شت دەخوا ☰ ١. چندش‌آور؛ نفرت‌انگیز ٢. بدغذا

**قیزهەڵشێوێن** / qîzhelşêwên/: ☜ قیزەوشێوێن

**قیزیای** / qîzyay/: چاوگ. قیز شێوان ☰ چندش آمدن

**قیژ**[1] / qîj/: ناو. قاژوو ☰ زغن

**قیژ**[2]: دەنگەناو. زیرە؛ دەنگی تیژ ☰ جیغ

**قیژاندن** / qîjandin/: چاوگ. تێنەپەڕ. //قیژاندت؛ دەقیژێنی؛ بقیژێنە// قیژانن؛ قیژین؛ زیراندن ☰ جیغ کشیدن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەقیژاندن

**قیژانن** / qîjanin/: ☜ قیژاندن

**قیژقیژۆک** / qîjqîjok/: ناوەڵناو. قیژن؛ تایبەتمەندی زارۆکێ کە زۆر و بە بێ هۆ دەزیقێنێ ☰ جیغ ـ جیغو

**قیژک** / qîjik/: ☜ قالاو

**قیژلاندن** / qîjlandin/: چاوگ. قرچاندن؛ داخ کردن و وە چۆقەچۆق خستنی ڕۆن ☰ گُداختن روغن

**قیژن** / qîjin/: ☜ قیژقیژۆک

**قیژنای** / qîjnay/: چاوگ. قیژاندن ☰ جیغ کشیدن

**قیژ و قاژ** / qîj û qaj/: ☜ قیژ و هۆڕ

**قیژ و واژ** / qîj û waj/: ☜ قیژ و هۆڕ

**قیژ و وڕ** / qîj û wiř/: ☜ قیژ و هۆڕ

**قیژ و ویژ** / qîj û wîj/: ☜ قیژ و هۆڕ

**قیژ و هۆڕ** / qîj û hoř/: دەنگەناو. قیژ و قاژ؛ قیژ و وڕ؛ قیژ و واژ؛ قیژ و ویژ؛ زەنا ـ زەنا ‹دەنگی قیژ و هۆڕی خەڵکە دێت لە ژێر چەرخی زەمان/ ئاهی مێردکوژراوی کوردە عالەمێ وێران ئەکا «قانع»› ☰ جیغ و داد

**قیژۆک** / qîjok/: ☜ قراکە

**قیژە** / qîje/: دەنگەناو. قیژ؛ زیقە ☰ جیغ

▣ **قیژە کردن**: زیراندن ☰ جیغ کشیدن

**قیژە کێشان**: ☜ قریشکاندن ـ١

**قیژەقیژ**[1] / qîjeqîj/: دەنگەناو. زیقەی زۆر و لە دوای یەک ‹ڕۆژ دەبێتەوە قیژەقیژی ئەو دوو منداڵە وا لە گوێمدا!› ☰ جیغ زیاد

**قیژەقیژ**[2]: سارستە. هەراهەرا؛ فەرمان بە بێدەنگی ‹دا قیژەقیژ! سەرمان چوو› ☰ فرمان به خاموشی

**قیژین** / qîjîn/: ☜ قیژاندن

**قیس** / qîs/: ناو. کیس؛ ڕادەس؛ بەردەست ‹خۆ تۆش دەزانی کە کوردەواری/ لە قیسمان بچێ تووش دێین هەژاری «هێمن»› ☰ دسترس

**قیسپ** / qîsp/: ناو. قسپ: ١. داری نیوە ئەستووری چوار- پێنج بستی کە بۆ پەرژین دەیچەقێنن یان بە سەر دارەڕای ڕادەکەن ٢. داری چەقاوی لێواری ئەڕابەی کەڵی لە کڵۆش کێشاندا ٣. دڕکی گەورە و ئازاردەر ‹بەڵا وە قیسپ ئەگەرێ «مەسەل»› ٤. کارەسات؛ چۆرتم؛ بەسەرهات و ڕووداوی ناخۆش ‹دەترسم ئەم کابرایە تووشی قیسپێکمان بکا› ☰ ١. چوب ثابت دیوارەی پرچین ٢. تیر چوبی کنار ارابه ٣. خار درشت ٤. مُصیبت

**قیست / qîst/**: ناو. ١. گیایەکە ٢. قست؛ قسن؛ پاژ؛ بەشێک لەوەی کە لە ماوەگەلی یەکساندا دەبێ بدرێ یان وەربگیردرێ ☰ ١. گیاهی است ٢. قسط

**قیستی¹ / qîstî/**: ئاوەڵناو. قستی؛ قسنی؛ پاژی؛ بە شێوەی پارە سەندنەوە یان دانەوەی بەرە ـ بەرەی شتی مامەڵە کراو ‹ماشێنی قیستی› ☰ قسطی

**قیستی²**: ئاوەڵکار. قستی؛ پاژی؛ بە قیست ‹ماشینەکەی قیستی سەندووە› ☰ قسطی

**قیسک / qîsk/**: ناو. قیسکە؛ چیکلدانە ☰ ژاغر؛ چینەدان

**قیسکە¹ / qîske/**: ☜ **قیسک**

**قیسکە²**: ئاوەڵناو. چکۆلەی پووتەکە (منداڵ) ☰ فسقلی (کودک)

**قیش / qîş/**: ناو. ١. بانوو؛ بانە؛ دەشتی بلندتر لە دەوروبەری خۆی ٢. قوڕ؛ حەڕی؛ خەڕگ ٣. قەڵشی لێو ☰ ١. فلات ٢. گِل ٣. ترک لب

**قیشاڤ¹ / qîşav/**: ناو. قوڕاو؛ لیتە؛ چلپاو ☰ لجن

**قیشاڤ²**: ئاوەڵناو. قەڵشیو؛ ترەکیاگ ☰ ترک برداشته

**قیفار / qîfar/**: ناو. قیڤار؛ دڕکێکی سپییە ☰ خاربُنی سفید

**قیڤار / qîvar/**: ☜ **قیفار**

**قیق / qîq/**: ئاوەڵناو. ١. لەڕ؛ دالگۆشت ٢. ملباریک ☰ ١. لاغر ٢. گردن‌باریک

**قیقی / qîqî/**: ناو. ١. دارکوتکە؛ دارتەقێنە ٢. قوقووی کەڵەشێر ٣. *[کینایە]* مری؛ مامر ☰ ١. دارکوب ٢. صدای خروس ٣. ماکیان

**قیقیداوکە / qîqîdawke/**: ناو. قیقی ڕەجو؛ زیقاوە ☰ خروس کولی

**قیقیڕەجو / qîqîřecw/**: ☜ **قیقیداوکە**

**قیل¹ / qîl/**: ناو. ١. کەلپی دڕندە؛ ددانی پێشەوەی دڕندە ٢. قیر ٣. دەسەگری لە یاریدا ☰ ١. دندان ناب درنده ٢. قیر ٣. یارگیری در بازی

⊡ **قیلی کەوای سپی**: *[کینایە]* ملۆزم و مێمل ☰ مُزاحم

⊡ **قیل کردن**: یار گرتن؛ دەسە ڕێک خستن لە برێ کایەدا ☰ یار گرفتن در برخی بازی‌ها

**قیل دۆزینەوە**: یار دۆزینەوە لە برێ یاری بەکۆمەڵدا ☰ یار گرفتن در برخی بازهای گروهی

**قیل²**: ئاوەڵناو. قووڵ؛ نووق؛ سووتار ☰ گود؛ عمیق

**قیلاوی / qîlawî/**: ☜ **قیراوی**

**قیلتاو / qîltaw/**: ☜ **قیرتاو**

**قیلکە¹ / qîlke/**: ناو. چیلکە؛ چیلە؛ لقی باریک و کورت ☰ ساقه و چوب کوچک خلال مانند

**قیلکە²**: دەنگەناو. حیلکە؛ دەنگی پێکەنین ☰ هِر- هِر خنده

**قیلمقازە / qîlmqaze/**: ناو. سەرشان ☰ ترقوه

**قیلە / qîle/**: ناو. خزم؛ قەوم ☰ خویشاوند

**قیلەتاو / qîletaw/**: ☜ **قیرتاو**

**قیلەقاچ / qîleqaç/**: ☜ **قیلەوقاچ**

**قیلەوقاچ / qîle w qaç/**: ئاوەڵناو. قیرقاچ؛ قیرقاچ؛ قیروقاچ؛ قیروقاچ؛ قیلەوقانج؛ قیلەقاچ؛ قیچەڵقاچ؛ قیچەڵفاچ؛ قیچەڵپاچ؛ شەفتوور ☰ اُریب

**قیلەوقانج / qîle w qanc/**: ☜ **قیلەوقاچ**

**قیم¹ / qîm/**: ناو. چۆنیەتی ڕازی بوون ☰ رضایت

⊡ **قیم ئانین**: ڕازی بوون ☰ راضی شدن

**قیم پێ ئانین**: پێ ڕازی بوون؛ پێ قایل بوون ☰ روا داشتن

**قیم هاتن**: ڕازی بوون ‹قیما من نایە› ☰ رضایت دادن

**قیم²**: ئاوەڵناو. بەس؛ بەسندە؛ بەسنە ☰ بس؛ کافی

**قیمە / qîme/**: ناو. ١. پەل؛ گۆشتی ئەنجنراو

‹مەلوول و زویر خاتر پەرێشان/ چمان قیمەی جەرگ ئەمن مەکێشان «سەیدی»› ٢. گۆشتی چەرخکراو 🇮🇷 ١. قیمه؛ گوشت خرد شده ٢. گوشت چرخ کرده

⊡ **قیمە کردن/ کرن:** کردنە قیمە 🇮🇷 چرخ کردن گوشت

**قیمەت** / qîmet/: ناو. نرخ؛ بایی 🇮🇷 قیمت

**قیمەتدار** / qîmetdar/: ئاوەڵناو. ١. بە جەوهەر و هونەر ٢. گران؛ گرانبایی 🇮🇷 ١. با استعداد ٢. گرانبها

**قیمەتی** / qîmetî/: ئاوەڵناو. زۆر بەنرخ؛ بەهادار ‹شیری قیمەتی› 🇮🇷 قیمتی

**قیمە ـ قیمە** / qîme qîme/: ئاوەڵناو. تیکە ـ تیکە؛ ئەنجن ـ ئەنجن‌کراو 🇮🇷 قطعه ـ قطعه

**قیمەکێش** / qîmekêş/: ناو. ساتۆری چەماوی گۆشت ورد کردن 🇮🇷 ساتور قیمه‌کش

**قیمیش** / qîmîş/: ناو. دۆخی ڕجوا زانین؛ ڕەوا دیتن 🇮🇷 رضایت

**قین** / qîn/: ناو. ١. ڕق؛ تووڕەیی؛ قەڵسی؛ ڕک؛ قار ‹ڕەقیب و موددەعی وەک پووش و پووشوون/ بسووتێنن، کە وەک بەرقین، لە بەر قین «نالی»› ٢. *[شوورەیی]* قن؛ قنگ 🇮🇷 ١. خشم؛ کینه ٢. کون

⊡ **قین جواندن:** ڕک هەڵساندن 🇮🇷 خشم برانگیختن

**قین جوین:** ڕک هەڵسان 🇮🇷 به خشم آمدن

**قین خواردنەوە:** ڕک لە بیر خۆ بردنەوە؛ پیش خواردنەوە 🇮🇷 خشم خود را فرو خوردن

**قین کردن:** لەنج کردن 🇮🇷 لج کردن

**قین گرتن:** کەوتنە سەر ڕک؛ پێ چەقاندن 🇮🇷 لج کردن

**قین لێ بوون:** خۆش نەویستن؛ ڕک لێ بوونەوە 🇮🇷 تنفر داشتن

**قین لێ کەوتن:** ☜ **قین لێ‌هەستان**

**قین لێ هەستان/ هەڵستان:** قین لێ کەوتن؛ لێ تووڕە بوون 🇮🇷 از کسی به خشم آمدن

**قین لێ هەڵگرتن:** تووڕە بوون و چاوەنۆڕی هەل بوون بۆ تۆڵە 🇮🇷 کینەی کسی را بە دل گرفتن

**قین هەستان/ هەڵسان:** قین هەڵسان؛ ڕک هەستان 🇮🇷 به خشم آمدن

**قین هەستاندن/ هەڵستاندن:** قین هەڵستاندن؛ ڕک هەستاندن 🇮🇷 خشم برانگیختن

**قین هەڵگرتن:** ڕک لە دڵا هێشتنەوە 🇮🇷 کینه به دل گرفتن

**کەوتنە قینەوە:** کەوتنە سەر باری لەنج و نەیاری. هەروەها: **خستنە قینەوە** 🇮🇷 سر لج افتادن

**قین‌ئەستوور** / qîn'estûr/: ئاوەڵناو. ڕق‌ئەستوور؛ تایبەتمەندی کەسێ کە درەنگ لە تووڕەیی خاو دەبێتەوە 🇮🇷 کینه‌توز

**قینات** / qînat/: ☜ **قنیات**

**قیناوی** / qînawî/: ئاوەڵناو. ڕکوونی 🇮🇷 کینه‌یی

**قینجک** / qîncik/: ☜ **قینچك**

**قینچک** / qînçik/: ناو. قینجک؛ قونجک 🇮🇷 انتهای میوه

**قیندار** / qîndar/: ئاوەڵناو. بەقین؛ دڵ پڕ لە ڕک 🇮🇷 کینه‌ورز

**قینشەلە** / qînşele/: ناو. کەمتیار 🇮🇷 کفتار

**قینگ** / qîng/: ☜ **قون**

**قین‌لەبەر** / qînleber/: ☜ **قین‌لەدڵ**

**قین‌لەدڵ** / qînledił/: ئاوەڵناو. قین‌لەبەر؛ قین‌ون؛ قین‌لەسک؛ قین‌لەزگ؛ قینەون؛ ڕکوونی 🇮🇷 کینه‌توز

**قین‌لەزگ** / qînlezig/: ☜ **قین‌لەدڵ**

**قین‌لەسک** / qînlesik/: ☜ **قین‌لەدڵ**

**قین‌لەقنە** / qînleq(i)ne/: ناو. کلک‌هەڵتەکێنە؛ دوهەژێنک 🇮🇷 دُم‌جنبانک

**قین‌وقینکاری** / qîn û qînkarî/: ناو. ڕک و ڕکەبەری ☰ کینەکشی

**قینون** / qînwin/: ☜ **قین‌لەدڵ**

**قینەبەری** / qîneberî/: ناو. ڕکەبەری؛ ململانێ ☰ رقابت

**قینەون** / qînewin/: ☜ **قین‌لەدڵ**

**قینەونی** / qînew(i)nî/: ناو. دۆخی قین و ڕک لە دڵ بوون ☰ کینەتوزی

**قیو** / qîw/: دەنگەناو. قریوە؛ گوڕڕە؛ دەنگی بەرز و بەهەیبەت ☰ غریو

**قیواندن** / qîwandin/: چاوگ. گوڕڕاندن؛ قریوە کردن ☰ غریویدن

**قێ** / qê/: ناو. ناوی بیستویەکەمین پیتی ئەلفبای زمانی کوردی ☰ قاف؛ بیست‌ویکمین حرف الفبای کُردی

**قێچ** / qêç/: ناو. کێچ؛ جانەوەرێکی چکۆڵەی ڕەشی خۆشبەزی ئاماڵسوورە، خوێنی زیندەوەر دەمژێ ☰ کک

**قێچی** / qêçî/: ناو. قەیچی؛ دوێرد؛ تۆرتۆ؛ مقەست؛ مەقەس ☰ قیچی

**قێخا** / qêxa/: ناو. کەیخودا؛ کێخا ☰ کدخدا

**قێخایی** / qêxayî/: ناو. کەیخودایی؛ کێخایی ☰ کدخُدایی

**قێد** / qêd/: ناو. ئالقەی ئاسن ☰ حلقەی آهنی

**قێرچان** / qêrçan/: چاوگ. قیرچین؛ سیڕەسیڕ لە ددان هاتن ☰ صدا از بر هم ساییدن دندان‌ها ایجاد شدن

**قێرچاندن** / qêrçandin/: چاوگ. ددان بە سەر یەکدا ساوین؛ سیڕەسیڕ لە ددان هێنان ☰ دندان بر هم ساییدن

**قێرچین** / qêrçîn/: ☜ **قێرچان**

**قێڕ** / qêř/: ☜ **قۆڕ-۱**

**قێڕاندن** / qêřandin/: چاوگ. هاوار کردن ☰ فریاد کشیدن

**قێڕنای** / qêřnay/: چاوگ. قیڕاندن ☰ فریاد کشیدن

**قێڕە** / qêře/: ☜ **قۆڕ-۱**

**قێڕەگون** / qêřegun/: ☜ **قۆڕ-۱**

**قێز**[1] / qêz/: ناو. بێز؛ ڕەوتی دڵ تێکچوون لە دیتنی شتێ ☰ دل به هم آمدن از دیدن چیزی

⊡ **قێز بوون**: ناشیرین بوون ☰ زشت شدن

**قێز بوونەوە**: ☜ **قێز شێوان**

**قێز شێوان/ شێویان/ شێویانەوە**: قێز بوونەوە؛ قێز شێویانەوە؛ قێز کردن/ کردنەوە؛ دڵ شێوان لە دیتنی شتێ ‹تیکەکەت دەرمەهێنە، قێزمان شێواوە› ☰ دل به هم آمدن از دیدن چیزی

**قێز کردن/ کردنەوە**: ☜ **قێز شێوان**

**قێز**[2]: دەنگ. وشەیەکە لە کایەدا واتا: تەسلیم ☰ اصطلاحی در بازی به معنی تسلیم

⊡ **قێز بوون**: تەسلیم بوون لە یاریدا ☰ تسلیم شدن در مسابقه

**قێزوبێز** / qêz û bêz/: ☜ **قیزوبیز**

**قێزووێز** / qêz û wêz/: ☜ **قیزوبیز**

⊡ **قێز و وێز کردن**: ئیش و ویش کردن؛ قیز کردن و دڵ شێوان لە دیتنی شتێ ☰ بیزاری نمودن از چیزی

**قێزە** / qêze/: ناوەڵناو. دزێو؛ ناشیرین ☰ زشت

**قێزەون** / qêzewin/: ☜ **قیزەون**

**قێقنای** / qêqnay/: چاوگ. کورکاندن (مریشک و ...) ☰ قُدقُد کردن

**قێل** / qêl/: ناو. گوانی ئاژەڵی شیردەر ☰ پستان دام شیردە

**قێنبنە** / qênb(i)ne/: ناو. گیایەکی بەهارییە دەخورێ ☰ گیاهی خوراکی

**قێوڵدار** / qêwiłdar/: ناوەڵناو. بەختەوەر؛ بەختیار ☰ خوشبخت

# ک

**ک / k/**: پیت. بیستودووهەمین نیشانەی ئەلفوبێی زمانی کوردی ☰ ک؛ بیستودومین حرف الفبای کُردی

**ک¹ / ki/**: ناو. ناوی بیستودووهەمین ئەلفوبێی زمانی کوردی ☰ ک؛ بیستودومین حرف الفبای کُردی

**ک²**: ئامراز. کە؛ بۆ ئەوەی ‹وای وت ک نەچی› ☰ کە

**• ک / -k, -ik/**: پاشگر. ١. پاشگری ئامرازسازە لە ڕەگی کار ‹ڕەنک؛ کوتک؛ ڕستک› ٢. پاشگری جێ ‹دەسک؛ زوورک› ٣. پاشگری پچووک کردنەوە ‹کنک؛ کوڕک؛ پاچک؛ کاپک؛ کچک› ٤. پاشگری تاک کردنەوە بە مانای یەک ‹گاک، واتا: یەک گا› ٥. ئامرازی ناساندن ‹مێرک؛ ژنک› ٦. پاشگری ناوسازە لە ئاوەڵناو ‹ڕاستک› ٧. بە دوای ڕەگی کارەوە ئاوەڵناوی فاعیلی دروست دەکا ‹سووتک› ٨. بە دوای ڕەگی کارەوە ناوێک دروست دەکا ‹تەزک› ٩. بە دوای ڕەگی کارەوە بۆ زێدە (موبالیغە) ‹گەڕک - زۆرگەڕ› ١٠. لە پێکهاتەکاندا دەکەوێتە پاشەوەی ڕەگی کار و ناوێک، زۆرتر ناوی ئامێر دروست دەکا ‹ئاردمالک› ١١. لە پێکهاتەکاندا دەکەوێتە پاشەوەی ڕەگی کار و ناو یان ئاوەڵناوێ دروست دەکا ‹ئاومالک› ☰ پسوند: ١. ابزارساز ٢. نشانەی جای، مکان ٣. نشانەی تصغیر ۴. یکی؛ به معنی یای نکره ۵. به معنی فلان، نشانەی معرفه ۶ اسم ساز از صفت ۷. پس از ریشەی فعل می‌آید و صفت فاعلی می‌سازد ۸. پس از ریشەی فعل می‌آید و اسم می‌سازد ۹. برای مبالغه، پس از ریشەی فعل می‌آید ۱۰. در ترکیبات پس از ریشەی فعل، اسم و غالباً اسم ابزار می‌سازد ۱۱. در ترکیبات پس از ریشەی فعل، اسم و صفت می‌سازد

**کا¹ / ka/**: ناو. ١. پاژی پچووک و کوتراوی لاسکە دەخڵ ‹کا لە خۆ و جۆ لە خۆ «مەسەل»› ٢. *[سووکەڵە]* کاک؛ وشەی ڕێز لێنانی برا گەورە ٣. وشەی ڕێز لێنانی کوڕ یان پیاوی گەورەتر ☰ ١. کاه ٢. داداش ٣. آقا

▣ **کای کۆن**: *[کینایە]* قسە و باسی ڕابردووی ڕابواردوو ☰ موضوع گذشته

⊡ **کا کێشان**: بردنەوەی کا بۆ ئاوایی ☰ کاه بُردن به آبادی

**کای کۆن بە با دان**: *[کینایە]* قسە و باسی کۆن هێنانە ئاراوە ‹گێرەشێوێنێ کە کای کۆنی بە بادا لە کنت/ چاکە هەر لێی‌خوڕی، سەیری دەم و کاوێژی نەکەی «شوکری فەزلی»› ☰ مسألەی قدیمی و تمام شده را پیش کشیدن

**کا**[1]: ئاوەلکار. کوێ؛ کام جێ؛ لە کوێ ☰ کُجا

**کا**[2]: دەنگ. ١. دا دەی؛ ئا بزانم ‹کا وەرە! کا ببینم!› ٢. با؛ بلا؛ بهێلە ‹کا بچێ بزانم چی دەکا؟› ☰ ١. دِ ٢. بگذار

**کائولین** / ka'ulîn/: ناو. خاکی چینی؛ خاکی سپی؛ خاکێکی مەیلەو سپی و ئاوکێشە، بۆ دروست کردنی چینی بە کار دێ و دەرمانی زگ چوونە ☰ کائولن

**کائۆچۆ** / ka'oço/: ☜ **کاوچۆ**

**کائین** / ka'în/: ☜ **کاوێژ**

**کاب** / kab/: ناو. قاپ؛ کاپ: ١. کابا؛ میچ؛ جگ؛ چوو ٢. گوێزنگ؛ کاب؛ قولەپێ ☰ ١. شتالنگ؛ قاب ٢. قوزک پا

**کابا** / kaba/: ☜ **کاب ـ١**

**کابارە** / kabare/: ناو. مەیخانەیەک بە هەموو جۆرە بەزم و سەما و ئاوازەوە بۆ ڕابواردنی مشتەرییان ☰ کابارە

**کابان** / kaban/: ناو. کاڤان؛ کەبان؛ کەبانوو؛ کەبانی؛ کەڤانی؛ کەوانی؛ کەوانوو؛ کەیوان؛ کەیوانوو؛ کەیوانە؛ کێڤانی؛ کێڤانیە؛ ژنی ئاگاداری ماڵ ‹لە خۆی داوە بەرەڵبێنە کچی کابانی گەردن‌کێل/ بە ناز و غەمزە دەڕوانێ، دەکا شینکەی نەرم پێشێل «هێمن»› ☰ کدبانو

**کابانەتی** / kabanetî/: ☜ **کابانی**

**کابانی** / kabanî/: ناو. کابانەتی؛ کەبانیتی؛ بناوانی ☰ خانەداری

**کابانێ** / kabanê/: ناو. کابەی؛ کاپانێ؛ کاپێن؛ جگێن؛ میچێن؛ قاپێن ☰ قاب‌بازی

**کابچک** / kabçik/: ناو. کاپچک؛ مەچەک؛ جومگەی نێوان دەست و قۆل ☰ مُچ دست

**کابرا** / kabra/: جێناو. کاورا: ١. فلان؛ کەسێ کە ناوی نابەن ‹سەری سووڕ مابوو ئەو کابرا نەزانە/ چلۆن گۆڕاوە ئەم دەور و زەمانە! «هێمن»› ٢. پیاوێ کە نایناسن ‹کابرایەکی ڕووت و برسیم/ ناساخ، گیرۆدەی نەزانیم «گۆران»› ☰ ١. یارو؛ فلان ٢. ناشناسِ مُذکر

**کابرەش** / kabreş/: ئاوەڵناو. ١. قاپڕەش؛ داوێن‌تاریک (ئەسپی کوێت) ٢. *[کینایە]* شووم؛ جوت قۆشە ☰ ١. پاسیاه (کُمیت) ٢. نحس

**کابگر** / kabgir/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* ١. دەمشڕ؛ جنێوفرۆش ٢. پاشملەبێژ ☰ ١. بدزبان ٢. غیبت‌گوی

**کابل** / kabl/: ناو. چەپکە تەلی بادراو و ڕووکێش‌کراو بۆ گواستنەوەی وزەی کارەبا و... ‹کابلی کارەبا؛ کابلی تەلەفوون› ☰ کابل

**کابۆخ** / kabox/: ناو. بەشە چێندراوێ کە لە هاوساکانی تێراوتر و گەش‌ترە ☰ بخشی از محصول که از بقیه پربارتر است

**کابۆک** / kabok/: ناو. کابووک: ١. کاپۆک؛ کەڤۆک؛ کۆتر ٢. لان؛ هێلانە؛ جێگەی سانەوە و خا تێکردنی باڵدار ☰ ١. کبوتر ٢. آشیانەی پرندە

**کابۆی** / kaboy/: ناو. گاوانی ئەمریکی ☰ کابوی

**کابۆیی** / kaboyî/: ئاوەڵناو. پێوەندیدار یان سەر بە کابۆی ‹کڵاوی کابۆیی› ☰ کابویی

**کابوس** / kabûs/: ناو. کاموس؛ مۆتەکە؛ خێو ☰ کابوس

**کابوک** / kabûk/: ☜ **کابۆك**

**کابە** / kabe/: ناو. ١. ☜ **کەعبە** ٢. ☜ **کابەك** ٣. گەنمەشامی؛ زەڕات ☰ ١. ☜ **کەعبە** ٢. ☜ **کابەك** ٣. ذُرّت

**کابەشاک** / kabeşak/: ناو. شانس؛ بەخت و ئیقباڵ ☰ شانس

**کابەک** / kabek/: ناو. کابە: ١. کەشکەک؛ کەشکەژنۆ؛ کەشکەوژنگ ٢. جومگەی دەست و پێ ٣. قەسەڵ؛ پرزەی کلۆش دوای دروونەوە ☰ ١. کاسەی زانو ٢. مُچ دست و پا ٣. کاه درشت ماندە از درو

**کابەی** / kabey/: ☜ **کابانێ**

**کابهور** / kabhûr/: ئاوەڵناو. [کینایە] باواقوڕەت؛ زۆر کورتەباڵا ⇐ کوتولە

**کابین** / kabîn/: ناو. هۆدە لە گەمیە، فڕۆکە و... ⇐ کابین

**کابینە** / kabîne/: ناو. کۆڕی وەزیران ‹دوێشەو دانیشتنی کابینە بەڕێوە نەچوو› ⇐ کابینە

**کابینێت** / kabînêt/: ناو. دۆلاوچە؛ قەفەسەی بە نهۆم و دەرگاوە بەتایبەت لە ئاشپەزخانەدا ⇐ کابینت

**کاپ** / kap/: ☜ **کاب**

**کاپان** / kapan/: ناو. ١. ڕێگەی تەسک و تەنگەبەر ٢. جگێن؛ گەمە بە جک ٣. کونی فرەوان لە میچی خانوودا ٤. نەغمەی بن دیوار کە مرۆی پێدا بچێ ⇐ ١. راهرو تنگ ٢. قاب‌بازی ٣. سوراخ گشاد در سقف خانه ٤. نقب کف اتاق

**کاپانێ** / kapanê/: ☜ **کابانێ**

**کاپچک** / kapçik/: ☜ **کابچك**

**کاپشەن** / kapşen/: ☜ **کاپشین**

**کاپشین** / kapşîn/: ناو. کاپشەن؛ قەمسەڵە؛ جۆرێک باڵاپۆشی گەرمی زستانی کە تا پشتێنە دێ و بە زیپ یان قوپچە هەڵدەپێکرێ ⇐ کاپشن

**کاپک** / kapik/: ناو. ١. پەتک؛ پەت؛ پارچە گوریس ٢. جگی چکۆڵە ⇐ ١. قطعە طناب؛ ریسمان کوتاه ٢. قاب کوچک

**کاپۆ** / kapo/: ناو. ١. خانووی باڵدار؛ هێلانە؛ هێلین؛ لانە ٢. ☜ **کەپۆ** ⇐ ١. آشیانە ٢. ☜ **کەپۆ**

**کاپۆچینۆ** / kapoçîno/: ناو. قاوە و کاکاهووی تێکەڵ کە لە شیری داخی دەکەن و بە شەکرەوە دەیخۆن ⇐ کاپوچینو

**کاپۆخ** / kapox/: ناو. ١. پووش و گیای گیرەکراو؛ گیای ئەنجناو ٢. کەسێ گیا ورد دەکا ⇐ ١. گیاه کوبیده ٢. کسی کە علوفە می‌کوبد

**کاپۆر** / kapor/: ناو. ڕەشکە تووتن؛ تووتنی زۆر خراپ ⇐ توتون نامرغوب سیاهرنگ

**کاپۆک** / kapok/: ناو. ١. ☜ **کۆتر**[١] ٢. پاوەنی لە زنجیری ئەسپ ⇐ ١. ☜ **کۆتر**[١] ٢. پابند زنجیری اسب

**کاپۆل** / kapol/: ناو. ١. تۆکڵ؛ توێکڵ؛ قاپێلک ٢. قاپێلکەسەر؛ کاسەی سەر ٣. گزرە؛ گیای وردکرداو ٤. کابەک؛ کابە؛ قەسەڵ ٥. کاگڵ؛ کای ڕەگەڵ حەڕی بۆ سواخ دانی بان ⇐ ١. پوستەی توخالی ٢. جُمجُمە ٣. علوفەی کوبیدە ۴. کاه درشت ماندە از درو ۵. کاهگل

**کاپۆلە** / kapole/: ☜ **کاپوولە**

**کاپۆڵ** / kapoł/: ناو. کاپۆڵک: ١. کەللە؛ قاپێلکەسەر؛ کاسەی سەر ٢. کەپۆ؛ بێڤل؛ پت؛ لووت ⇐ ١. جُمجُمە ٢. بینی

**کاپۆڵک** / kapołik/: ☜ **کاپۆڵ**

**کاپووت** / kapût/: ناو. ١. دەرگا یان پۆشەنی سەر موتوری ماشێن ٢. دەرکی سندووقی پشتەوەی ماشێن ٣. ☜ **کاندوم** ⇐ ١و٢. کاپوت ٣. ☜ **کاندوم**

**کاپوور** / kapûr/: ☜ **کافوور**

**کاپوولە** / kapûle/: ناو. کاپۆلە؛ کەپوولە؛ کەپوویلە؛ قەپوولە؛ قەپوویلەی؛ کەپوولەی ئارد پێوانی ئاشەوان ⇐ پیمانەی کوچک آسیابان

**کاپەک** / kapek/: ☜ **کەڕو**

**کاپیتالیست** / kapîtalîst/: ئاوەڵناو. ١. سەرمایەدار ٢. هۆگری سەرمایەداری ⇐ ١و٢. کاپیتالیست

**کاپیتالیسم** / kapîtalîsm/: ناو. سەرمایەداری ⇐ کاپیتالیسم

**کاپیتان** / kapîtan/: ناو. کەپتان: ١. فڕۆکەوان ٢. کەشتیوان؛ گەمیەوان ٣. سەرمەزد؛ ڕێبەری تیمی وەرزشی ⇐ ١تا٣. کاپیتان

**کاپێچ** / kapêç/: ناو. نەخۆشییەکی ڕەشەوڵاخە لە

کای زۆر خواردنەوە تووشی دێت 🇮🇷 نوعی بیماری دام

**کاپێن** / kapên/: ☜ **کابانێ**

**کات** / kat/: ناو. ١. دەم؛ سات ‹لەم بێخەبەری خۆمە کەساس و ماتم/ بێهوودە دەبووری دەم و سات و کاتم «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ٢. ☜ **خێرۆك** ٣. زەمین؛ عەرز؛ قاد ‹شۆرەکات› ٤. کەللە؛ کاسەی سەر ٥. پشتەمل؛ پشت مل 🇮🇷 ١. وقت ٢. ☜ **خێرۆك** ٣. زمین ٤. جُمجُمه ٥. پسِ گردن

**کاتا** / kata/: ناو. جۆرێ کولێرە کە لە بن ژێلەمۆدا دەبرژێ 🇮🇷 نوعی گرده نان

**کاتات** / katat/: ناو. کات: ١. کەللە؛ کاپۆل؛ کاسەسەر ٢. پشتەمل؛ پشت مل 🇮🇷 ١. جُمجُمه ٢. پسِ گردن

**کاتار** / katar/: ناو. پۆپەی کەڵەشێر 🇮🇷 تاجِ خروس

**کاتالۆگ** / katalog/: ناو. ١. دەفتەری نیشان‌دان و ناساندنی بەرهەم و پیتەوای ڕێخراوەیەک ٢. پەڕاوی ڕێنمای بەرهەمێکی پیشەیی ‹ئەم چەرخی دروومانە کاتالۆگی نییە؟› 🇮🇷 ١و٢. کاتالگ

**کاتب** / katib/: ناو. ١. حیسابگەر ٢. نووسەر ٣. سەرژمێر 🇮🇷 ١. حسابدار ٢. نویسنده ٣. سرشمار

**کاتبژێر** / katb(i)jêr/: ناو. تایمێر؛ ئامرازێک بۆ ڕاگرتن و ڕێخستنی کەرستەیەک لە کاتی دیاریکراودا 🇮🇷 تایمر

**کاتبەر** / katber/: ئاوەڵناو. وەخت‌گیر؛ درێژخایەن 🇮🇷 وقت‌گیر

**کاتبەش** / katbeş/: ناو. کەسێ کە کاری سەرژمێری پێ سپێراوە 🇮🇷 مسئول سرشماری

**کاتژمێر** / katj(i)mêr/: ناو. کاژمێر؛ دەمژمێر؛ گووسک؛ سەعات: ١. سەعاتە؛ کەرەسەیەک بۆ پێوان و دیاری کردنی کات ٢. کاتێ کە ئەو کەرەسەیە پیشانی ئەدات ‹کاتژمێر هەشتە بە کاتی هەولێر› ٣. یەکەی پێوانی کات کە بەو کەرەسەیە دەپێورێ، بەرانبەری ١/٢٤ شەو و ڕۆژ ‹قەتار دوو کاتژمێری‌تر دەڕوا› 🇮🇷 ١تا٣. ساعت

**کاتک** / katik/: ناو. کات؛ کەللە؛ کاپۆل 🇮🇷 جُمجُمه

**کاتکۆ** / katko/: ناو. سەعات؛ شێست خولەک ‹دانیشتنەکە دوو کاتکۆ وە درەنگ کەوت› 🇮🇷 ساعت

**کاتمۆک** / katmok/: ☜ **کارتیمۆك**

**کاتمی** / katmî/: ناو. ناوی گیایەکە 🇮🇷 گیاهی است

**کاتولیک**[1] / katulîk/: ناو. ١. یەکێک لە لقە گەورەکانی دینی مەسیح کە شوێنگری پاپ و دەوڵەتی واتیکانن ٢. هەر یەکە لە شوێنکەوتوانی مەزهەبی کاتولیک 🇮🇷 ١و٢. کاتولیک

**کاتولیک**[2]: ئاوەڵناو. کاتولیکی؛ پێوەندیدار بە ئەو لقە گەورە لە دینی مەسیح کە واتیکانەوە بەڕێوە دەچێ و پاپ لە سەروویە ‹نووسەرانی کاتولیک› 🇮🇷 کاتولیکی

**کاتولیکی** / katulîkî/: ☜ **کاتولیك**[2]

**کاتۆر**[1] / kator/: ناو. کاتار؛ پۆپەی کەڵەشێر 🇮🇷 تاج خروس

**کاتۆر**[2]: ئاوەڵناو. ١. لەوەڕ لێنەماو؛ ڕووتەوەبوو ‹دەشتەکە تەواو کاتۆر بوو› ٢. خەوەرهێن؛ هەواڵدەر 🇮🇷 ١. لُخت شده (مرتع) ٢. خبررسان

**کاتە** / kate/: ناو. ١. کارتە؛ وەچ؛ لکی تازە، پاش سەرچن کردن ‹کاتەی تووتن› ٢. ☜ **خێرۆك** ٣. *[کینایە]* گورگ؛ گوری ٤. پێشە؛ ئێسقان؛ هەستی 🇮🇷 ١. جوانەی تازە پس از سرچین کردن گیاه ٢. ☜ **خێرۆك** ٣. گُرگ ٤. استخوان

**کاتی** / katî/: ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. ساتی؛ سەردەمی؛ گاڤی 🇮🇷 موقت

**کاتیک** / katîk/: ☜ **کارتیخ**

**کاتیلکە** / katîlke/: ناو. کوچەڵە؛ بایەی بچووک 🇮🇷 کاسەی کوچک

**کاتیلە** / katîle/: ☜ **کیتەڵە**

**کاتێ** / katê/: ئاوەڵکار. جا؛ حەر؛ گاوا؛ وادێ؛ کە

🇮🇷 وقتی؛ گاهی که

**کـاتێر / katêr/**: نـاو. ئـامرازی بـڕینی مووکێـت، چەپکەکاغەز، مقەبا و... 🇮🇷 کاتر

**کاتێک / katêk/**: ئاوەڵکار. دەمێ؛ دەمێک؛ دەمێـو 🇮🇷 وقتی

**کـاتێکی / katêkî/**: ئاوەڵکار. دەمـا؛ وەختەکـە 🇮🇷 آن‌گاه

**کـاج / kac/**: ناو. ١. کاژ؛ کاژی؛ دارێکـی هەمیشـە سەوزی یەکپایـە بـە سـاقەتەی بـەرز و گرۆڤـەر، لقوپـۆی دوای سـاقەتە و گـەڵای دەرزیئاسـای جووت ـ جووتەوە ٢. زوورک؛ گردی لـە لم 🇮🇷 ١. درخت کاج ٢. تپه‌ی ماسه‌ای

**کاجیر / kacîr/**: ناو. کولۆخ؛ کاپۆڵ؛ قـەحفی سـەر 🇮🇷 جُمجمه

**کـاجیرە / kacîre/**: ناو. زەردی؛ قاقڵـی؛ قاخڵـی 🇮🇷 کافشه

**کاجینـە / kacîne/**: نـاو. زوورکـان؛ دەشـتێ کـە تەپۆڵکە ـ تەپۆڵکەی پچـووکی تێدایـە 🇮🇷 دشـت تپه‌ماهوری

**کـاچ / kaç/**: ناو. ١. ☜ **کەوچك** ٢. قاچ؛ لنـگ ٣. خرکەوپرکە؛ شتی بێنرخی ناومـاڵ ٤. خزگـەی ماسی؛ شوێنی خۆ تێ خزاندنی ماسی لە زستاندا 🇮🇷 ١. ☜ **کەوچك** ٢. لِنگ ٣. خرت‌وپرت ۴. پناهگاه ماهی در زمستان

**کاچاخ / kaçax/**: نـاو. قاچاخ؛ بەچکە وشـتری دوو بەهار دیتوو 🇮🇷 شتر دوساله

**کاچانی / kaçanî/**: ناو. دەفر و ئامان؛ قاپ و قاچاخ 🇮🇷 ظروف آشپزخانه

**کاچک / kaçik/**: ☜ **کەوچك**

**کـاچلۆک / kaçlok/**: ناو. قـازانی بچـووک 🇮🇷 دیـگ کوچک

**کاچوکولووسک / kaç û kulûsk/**: ☜ **کاچوکوڵۆز**

**کاچوکوڵۆز / kaç û kułoz/**: ناو. کـاچوکولووسـک؛ خرکەوپرکە؛ شتانی بێ قیمەت 🇮🇷 خرت‌وپرت

**کـاچۆ / kaço/**: ئاوەڵناو. [پلار] تەمەڵی بێکار 🇮🇷 تنبل بیکار

**کاچوو / kaçû/**: ☜ **کارچوو**

**کـاخ / kax/**: ناو. ١. کاخە؛ قەسر؛ کۆشک ٢. بـژار؛ وژن؛ وجێز؛ کاری خـاوێن کردنـەوەی مـەزرا لـە گژوگیـای خۆڕسـکی بـێکەڵـک ٣. لۆدەکـای دەشت کە بۆ زستان گلەبان دەکرێ 🇮🇷 ١. کاخ ٢. وجین ٣. کاهی که برای زمستان در دشت نگهـداری می‌شود

**کـاخلی / kaxłî/**: ناو. کاژێلە؛ کاژیرە؛ قاخلی؛ قاقلی 🇮🇷 کاجیره

**کاخە / kaxe/**: ☜ **کاخ ـ١**

**کاخیـل / kaxîl/**: نـاو. ١. سـەوزەی چیمـەن ٢. پووشی دەشت کە لە گیشە دەدرێ 🇮🇷 ١. سبزه‌ی چمن ٢. خار و خس گردآوری‌شده‌ی دشت و صحرا

**کاد / kad/**: ناو. ١. کات؛ قاد؛ عەرد؛ زەمین؛ زەوی ٢. مەیدان؛ مەیان ‹کـادا شـەڕێ› 🇮🇷 ١. زمـین ٢. میدان

**کادان / kadan/**: نـاو. ١. ☜ **کادین** ٢. فـەرەنجی 🇮🇷 ١. ☜ **کادین** ٢. نوعی پالتوی نمدی

**کادانە / kadane/**: ناو. ڕەسەنە ئەسپێکە دەڵێن لە ڕووسیاوە هاتووە 🇮🇷 نژادی از اسب

**کـادر / kadir/**: نـاو. ١. چوارچێـوە؛ بیچمێکـی هەندسی یان ڕازێنەیی کە بـۆ جـوانی یـان زەق کردنەوەی نووسراوە یـان وێنەیـەک دەورەکـەی پێ دەگرن ‹ئاگەداریی سەرەخۆشییەکەی خرابـووە ناو کادرێکی ڕەش› ٢. ئەندام؛ کەسێکی ڕاهاتووی لێزان بۆ کار لـە ڕێخراوەیەکـدا ‹کـادری حیـزبی؛ کادری سیاسی› ٣. [وێنەگری] هەرکام لە وێنەگەلی فیلمێـک ٤. [مـەجاز] چـواردەور؛ چوارچێـوە؛ کەوشەن 🇮🇷 ١تا۴. کادر

**کادڕ / kadiř/**: ناو. شەنەی ئاسن 🇮🇷 افشون آهنی

**کادز** / kadiz/: ☜ **کاکەشان**

**کـادک** / kadik/: نـاو. بابۆڵــە؛ تیکــەی لوولــە ☰ ساندویچ

**کـادمیوم** / kadm(i)yum/: ناو. تـوخمی کیمیـایی کانزایی بە ژمارەی ئەتومی ٤٨ و کێشی ئـەتومی ١١٢,٤٠ بـە ڕەنگـی سـپی مەیلـەو ئـاوی، زۆر ژەهـری، چـەکوچخۆر، کـە لـە ئاوکـاری کـانزادا کەلکی لێ دەگرن ☰ کادمیُم

**کادو** / kadu/: ناو. دووکەڵ؛ مۆران؛ دووکێل ☰ دود

**کادۆ** / kado/: نـاو. دیاری؛ پێشکەشی؛ پێشکێشی؛ کادۆ؛ ئەوی بە هۆی ڕووداوێک یان بـە گـوێرەی دابی کۆمەڵگا بە کەسێک دەدرێ ☰ کادو

**کـادوو** / kadû/: ناو. کادی؛ دووکەڵ؛ دووکێـل؛ دوو ☰ دود

**کادە** / kade/: ☜ **کولیچە**

**کادی** / kadî/: ☜ **کادوو**

**کادین** / kadîn/: ☜ **کادێن**

**کـادێن** / kadên/: نـاو. کـادان؛ کـادین؛ کایــەن؛ کەیان؛ کەییان؛ کیان؛ کادانە؛ کەدن: ١. کـەدوو؛ کـەیو؛ کیـو؛ تفاقـدان؛ مـەرەک؛ ئاخلـە؛ لـوودە؛ جێگەی کۆ کردنەوە و ڕاگرتنی خۆراکی ئـاژەڵ و چوارپێیان ٢. [کینایە] زگ؛ سـک ‹کـا هـی خـۆت نییە، کادێن هی خۆتە! «مەسەل»› ☰ ١. کاهدان ٢. شکم

◙ **کـادێن مێشـی**: کادێنـــەمێش؛ شـــوێنی خلێفەمێشان؛ جێگەیەک کە پلوورە هەنگی لێ داندراون ☰ کندوی زنبور عسل

**کادێنەمێش** / kadênemêş/: ناو. خەلـێف؛ پلـوورە؛ جێگەی هەنگ ☰ کندو

**کـار**[1] / kar/: نـاو. ١. ئـیش؛ خـەبات؛ ئـەو شـتە کەسـێک بـە خۆیـەوە خـەریک دەکـا ‹کـاری هونەری› ٢. ئیش؛ پیشە؛ شوول؛ فرمان؛ چـالاکی سەرەکی بـۆ بـەڕێوەبردنی ژیـان ‹لـە کـوێ کـار دەکەی؟› ٣. کردە؛ ئاکار؛ ڕەفتار ‹کـارێکی باشـت کـرد› ٤. بـالووک؛ بالووک ٥. بێچـووی بـزن و بزنەکێفی و مـامز ٦. دەسـکرد؛ بەرهـەم ‹ئـەوی ڕووی داوە لـە مـن کـاری دڵـی بەدبەختـە/ وا مـنی کردووە بۆ تیری مەلامەت بە نیشـان «کـوردی»› ٧. قازانج؛ کەڵک ‹مەیگێڕ وەرە ئەم هۆشە بە کارم نایە/ مردن ڕەشەبایێکە، ژیانم کایە «هـەژار، *چوارینـەکانی خـەییام*»› ٨. ڕووداو ‹کارێکـە و بـووە، ئێسـتا چـی بکەین؟› ٩. ڕچە؛ کـۆرەڕێ ١٠. خوێڵـێن؛ کـانی خوێ ١١. حاڵ و باڵ؛ بار و دۆخ ‹کارم لە گریانـدا نەماوە› ١٢. کاریگەری؛ کارتێکـەری ‹ڕاسـتە مـن ڕێبوارم، سەر پێیی ئەڕوانم/ بەلام وا جوانیی تۆ کـاری کـرد لـە گیـانم «گـۆران»› ١٣. کاروبـار؛ ئـیش و بەرنامە ‹بێ پـاس و بـێپارێزگـاری/ سـەقام نـاگرێ هەرگیز کاری «گۆران»› ١٤. ئەرک؛ ئەو ئیشەی لە کەسێک چاوەڕوان دەکرێت ‹قاپ شـۆردن کـاری مـن نییـە› ١٥. پێوەنـدی؛ ڕەبـت ‹خۆشەویسـتی کاری بە بیر و باوەڕەوە نییە!› ☰ ١و٢. کـار ٣. رفتـار ۴. زگیل ۵. بچەی بُز و بُز کوهی ۶. محصول ۷. سود؛ نفع ۸. حادثه ۹. کورەراه ۱۰. معدن نمک ۱۱. حـال و وضع ۱۲. تاثیر ۱۳. کاروبار ۱۴. وظیفه ۱۵. ارتباط

◙ **کار بۆ کەر و خواردن بۆ بارگین**: [*کینایە*] دۆخ و چۆنیەتی زەحمەت کێشانی کەسێک و قـازانج بردنی کەسێکی تر ☰ **کار کـردن خـر و خـوردن یابو**

**کـاری خێـر**: ١. پیشـەی بـاش و خواپەسـەند ٢. [*کینایە*] زەمـاوەن؛ شـایی ٣. [*کینایە*] هـاوجێیی حەلال و ڕەوا ☰ ١. کار خیر ٢. عروسی ٣. جماع زن و شوهر

◙ **کار برانەوە**: کۆتایی هاتنی کارێک. هـەروەها: **کار برینەوە** ☰ تمام شدن کار

**کـار بـۆ تاشین**: [*مـەجاز*] کـار بـۆ دۆزینـەوە (و دەردیسـەر دان) ‹هـەر ڕۆژ کـارێکی تـازەم بـۆ

ئەتاشێ› ☳ کار تراشیدن

**کار بوران:** [مەجاز] ڕۆژگار چەرخان ☳ گذشتن

**کار بە کاری کەسێکەوە نەبوون:** ۱. خۆ هەڵنەقوڵتان لە کاروباری دیتراندا ۲. لە هیچ کارێکدا نەبوون؛ لە کارێکدا بەشدار نەبوون ‹نازانم ئازادیان بۆچی گرت، خۆ ئەو کاری بە کاری کەسێکەوە نەبوو› ☳ ۱و۲. کار بە کار کسی نداشتن

**کار بەردان:** واز لە کار هێنان ☳ دست از کار کشیدن

**کار پەیدا کردن:** ☜ **کار دۆزینەوە**

**کار پێ بوون:** کار بە کەسێک بوون ‹کارم پێت هەبوو، نەهاتی› ☳ کار با کسی داشتن

**کار پێ دان:** پیشەیەک بە کەسێک دان ☳ کار به کسی دادن

**کار پێ سپاردن:** قەوینتی کردن بۆ کارێک ☳ سفارش دادن کاری به کسی

**کار پێ کردن:** ☜ **بردنە کار**

**کار تەفرە دان:** کار خستنە دواوە ☳ کار را عقب انداختن

**کار تێکردن:** کار لێ کردن؛ تاسیر لێ کردن ☳ تحت تأثیر (چیزی) قرار گرفتن

**کار تێکەوتن:** کار بە کەسێ بوون ☳ با کسی کار داشتن

**کار چوونە پێش:** سەرکەوتن لە کاردا ☳ کار از پیش رفتن

**کار خستن:** خستنە خەبات ☳ به کار انداختن

**کار خەوتن:** کار ڕاگیران؛ وێستانی کار ‹دوو مانگە کارەکەمان خەوتووە› ☳ کار خوابیدن

**کار دانە دەستەوە:** [مەجاز] تووشی کێشە کردن ‹ئەم پێشنیارەی تۆ کاری دا دەستمانەوە› ☳ کار دست کسی دادن

**کار دۆزینەوە:** کار پەیدا کردن؛ دۆزینەوەی ئیش و فرمان ☳ کار پیدا کردن

**کار ڕاگیران:** ☜ **کار خەوتن**

**کار فەوتان/ فەوتیان:** کار سەر نەگرتن؛ دەرفەت لە دەس چوون ☳ فرصت کار از دست رفتن

**کار کردن:** ۱. خەبتین؛ فرمان کردن ۲. ئەنجام دانی کاری خوازراو ۳. کار تێ کردن؛ خاوەن کاریگەری تایبەت بوون ‹من باکم نییە، هەر لەبەر تۆمە/ قسەت کار ناکا، بەردی بن گۆمە «بێکەس»› ☳ ۱و۲. کار کردن ۳. اثر بخشیدن؛ تأثیر داشتن

**کار کردنی زگ:** ۱. چوونە سەر ئاو ۲. ڕەوان بوونی زگ ☳ ۱. دستشویی رفتن ۲. اسهال بودن

**کار کرن:** ۱. خۆ ساز و تەیار کردن ۲. قازانج لە سەودا کردن ☳ ۱. مُهیا شدن ۲. نفع بردن در مُعامله

**کار کەتن:** کار تێ کەوتن؛ کار پێ بوون ☳ کار آدم به دست کسی افتادن

**کار کەوتنە (لای) کەس یان جێگایەک:** کەل کەسێ لە کەس یان جێگایەک کەوتن ☳ کار کسی به کسی یا جایی افتادن

**کار لە کار ترازان:** [مەجاز] هەل و دەرفەت لە دەست چوون ‹تازە کار لە کار ترازاوە و خەفەت خواردن هیچی لێ شین نابێ› ☳ کار از کار گذشتن

**کار لێکردن:** ☜ **کار تێ کردن**

**کار هاوردنە بەر کان:** کارێ تەواو نەکردن و دەست بۆ کارێ تر بردن. هەروەها: **کار هاتنە بەر کار** ☳ کاری را ناتمام رها کرده و پی کار دیگر رفتن

**کار هەبوون:** کار بە دەستەوە بوون؛ سەرقاڵ بوون ‹کارم هەیە، ناتوانم بێم› ☳ کار داشتن

**کار یەکلا بوونەوە:** [مەجاز] بار و ئاکامی کار دەرکەوتن ☳ کار یک طرفی شدن

**کاری کەسێ ڕێخستن:** کاری کەسێک جێبەجێ کردن؛ داخوازی کەسێک بەجێ هێنان ☰ کار کسی را راه انداختن

**کاری کەسێ سەرگرتن:** بە ئاکام گەیشتنی کاری کەسێک ☰ کار کسی نتیجه گرفتن

**بردنە کار:** کردنە کار؛ نیانە کار؛ بە کار هێنان؛ هێنانە کار؛ کار پێ کردن؛ وەکوو ئامێرێک کەڵک لێ وەرگرتن. هەروەها: **برانە کار** ☰ بە کار بردن

**بە کار بردن:** ☜ **بردنە کار**

**بە کار هاتن:** بە کەڵک هاتن/ چوون/ ڕۆیین/ هێنان/ بردن ☰ بە کار آمدن/ رفتن/ بُردن

**بە کار هێنان:** ☜ **بردنە کار**

**چوونە کار:** ۱. بە کار چوون؛ بە کار بران؛ دە کار کران ‹بارێک زیخ چووە کار› ۲. چوون بۆ کردنی کارێ ☰ ۱. بە کار رفتن ۲. برای انجام کاری رفتن

**خستنە کار:** ڕێ خستن؛ بە شتێک کار دەست پێ کردن. هەروەها: **خرانە کار** ☰ راه انداختن؛ راەاندازی کردن

**کردنە کار:** ☜ **بردنە کار**

**کەوتنە کار:** دەست پێ کردن یان درێژە دانی کار ☰ بە کار افتادن

**لە کاردا بوون:** بەشدار بوون لە کارێک ‹نازانم چ دەستێ لە کاردا بوو؟› ☰ در کار بودن

**لە کار دەرهاتن:** *[مەجاز]* لە ئاو/ گڵ دەرهاتن ☰ از کار درآمدن

**لە کار کەوتن:** ۱. خراپ بوون ‹کەمپیوتەرەکەم لە کار کەوت› ۲. هێز نەمان؛ توانایی ئەنجام دانی کار نەمان ‹لە بەر ماندوویی و برسییەتی لە کار کەوتم› ☰ ۱و۲. از کار افتادن

**لە کار و کەرەم خستن:** *[مەجاز]* زۆر پیس کردن یان شێواندن و لە کەڵک خستن ‹بڕوا چی کردۆتە ماڵەکە؟ لە کار و کەرەمی خستووە!›. هەروەها: **لە کار و کەرەم کەوتن** ☰ از حیِّز انتفاع انداختن

**نیانە کار:** ☜ **بردنە کار**

**هێنانە کار:** ☜ **بردنە کار**

**کار**[2]: ئاوەڵناو. ۱. کاڵ؛ نەگەیشتوو ۲. نەکوڵاو؛ خاو ☰ ۱. کال؛ نارس ۲. ناپُختە

**کار -**[3]: پێشوشە. ۱. ئاکار؛ ڕەفتار ‹کارچاک› ۲. ئیش؛ فرمان ‹کارزان› ☰ ۱و۲. کار ـ

**- کار**[4]: پاشەوشە. ۱. ئەوەی بە شت یان ئامێرێک ئیش دەکات ‹سیمانکار› ۲. ئەوەی لێزانییەکی هەیە ‹خاتەمکار؛ جودۆکار› ۳. ئەوەی کە پیشە یان پلەیەکی تایبەتی هەیە ‹خاوەنکار› ٤. ئەوەی کە شێوەیێکی کرداری تایبەتی هەیە ‹خراپکار؛ گوناحکار› ٥. ـکێڵ؛ ـکاڵ؛ ئەوەی کە شتێک دەکێڵێ ‹پەمووکار› ٦. بەرهەمهاتوو؛ بارهاتوو ‹دێمەکار› ۷. ـ ساز؛ پێکهێن ‹دەسکار› ۸. چار؛ چارە ‹ڕێکار› ☰ ۱تا۵. ـ کار ۶ حاصل شده ۷. ـ ساز ۸ چاره

**- کار**[5]: پاشگر. ڕەنگ؛ شێوە ‹کۆسەکار؛ سوورکار› ☰ فام

**کار**[6]: پێرۆ. ← **کەس‌وکار**

**کارئاسک** / kar'as(i)k/: ☜ **کاراسک**

**کارئەندامناسی** / kar'endamnasî/: ناو. فیزیۆلۆجی ☰ فیزیولوژی

**کارا**[1] / kara/: ناو. کوچک؛ بەرد ☰ سنگ

**کارا**[2]: ئاوەڵناو. کارامە؛ بەکار؛ کردە؛ بەدەست؛ بەدەس؛ خاراو؛ بە توانا لە ئەنجامدانی کاردا ☰ کاری

**کاراتە** / karate/: ناو. وەرزشێکی شەڕەکی لای خۆرهەڵاتە بە زەربی دەست و پێ لە هەڤبەریان دەدەن ☰ کاراتە

**کاراتەباز** / karatebaz/: ☜ **کاراتەکار**

**کاراتەکار** / karatekar/: ناو. کاراتەکار؛ کەسێ کە لە وەرزشی کاراتەدا ڕاهاتووە ■ کاراتەکار

**کارازا** / karaza/: ☜ **کەرکیت**

**کاراس** / karas/: ناو. کاروش؛ گیایەکە ■ گیاهی است

**کاراسک** / karasik/: ناو. کارئاسک؛ کارمامز ‹زولفت چنووری بۆنخۆشی کوێستان/ چاوت وەک چاوی کاراسکی گەرمیان «فولکلۆر»› ■ بچەآهو

**کاراک** / karak/: ☜ **کانگا_۱**

**کارامە** / karame/: ئاوەڵناو. کارامەد: ۱. بە کەڵک؛ شیاو بۆ ئەنجام دانی کارێک ‹ئامێری کارامەی نازککاری› ۲. کارزان؛ ڕاهاتوو لە کار ‹بۆ خەباتی هاوبەشی یەکسانی توند و تیژی گەل/ لاوی کارامەی بەجەرگ و کیژی سەنگینم دەوێ «هێمن»› ■ ۱و۲. کارآمد

**کارامەد** / karamed/: ☜ **کارامە**

**کارامەیی** / karameyî/: ناو. کارایی: ۱. دۆخی بەکەڵک بوون ۲. لێزانی؛ کارزانی ■ ۱و۲. کارآمدی

**کارامێل** / karamêl/: ناو. قەنی سووتاو؛ ماکێکی قاوەیی تۆخ کە لە داخ کردنی قەن تا ۲۰۰ پلەک و بە هۆی خوێگەلی ئامونیۆمەوە چێ دەبێ و وەکوو ماکێکی ڕەنگی لە خۆراکی و خواردنەوەدا، بۆ جوانی و تام بە کار دەچێ ■ کارامل

**کارانە** / karane/: ناو. ۱. مز؛ حەقدەست ۲. شەرتەشوانی بەخێوکەری کاژیلە ■ ۱. مُزد ۲. مُزد چوپان برای مراقبت از بُزغالەها

**کاراوان** / karawan/: ناو. هۆدەیەکی چەرخدار بۆ حەسانەوە و خەوتن لە سەفەردا، کە بە دوای ماشینەوە دەبەسترێ ■ کاراوان

**کارایی** / karayî/: ☜ **کارامەیی**

**کاربان** / karban/: ☜ **کاروان**

**کاربرا** / karb(i)ra/: ناو. هاوکاری؛ هاوبەشی لە کاردا ■ همکاری

**کاربڕ**[1] / karbiř/: ناو. حاکم؛ میر؛ کەیخودا ■ حاکم

**کاربڕ**[2]: ئاوەڵناو. زۆر ئازا لە کار ■ چالاک

**کاربڵاو** / karb(i)ław/: ئاوەڵناو. نەپوخت؛ ناپوخت؛ شپرز ■ نامنظم

**کاربون** / karbun/: ☜ **کەربون**

**کاربۆ** / karbo/: ناو. ڕاژە؛ خزمەت؛ کارێ کە قازانجی بۆ کەس یان کەسانیتره ■ خدمت

**کاربووران** / karbûran/: ناو. *[مەجاز]* ئاوردوو؛ ئاردوو؛ سووتەمەنی ■ سوخت

**کاربەدەس** / karbedes/: ☜ **کاربەدەست**

**کاربەدەست** / karbedest/: ناو. کاربەدەس؛ کاروەدەس ‹تەنانەت دەیگوت: بە دووری نازانم ستالین کاربەدەستی ئینگلیس بێ! «هەژار، چێشتی مجێور»› ■ مُتصدی

**کاربەڕێکەر**[1] / karbeřêker/: ناو. کەسێ کە بە ناعیلاجی بۆ ماوەیەکی کەم کاروباری شوێنێک بەڕێوە دەبا ‹وەزیر ماوەی تەواو بووە و ئێستاکە کاربەڕێکەری وەزارەتە› ■ سرپرست

**کاربەڕێکەر**[2]: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی کەسێ کە کاروبارێک دەخاتە ڕێ ‹وەزیری کاربەڕێکەر› ■ سرپرست

**کاربەند** / karbend/: ناو. ۱. پیشە؛ سەنعەت ۲. دۆز؛ مەبەست و مەرام ■ ۱. پیشه؛ شغل ۲. مقصود؛ مرام

**کاربیت** / karbît/: ناو. کاربید؛ تێکئالاوی دوانەیی کەربون لەگەڵ کانزایەکدا ■ کاربید

**کاربید** / karbîd/: ☜ **کاربیت**

**کاربین** / karbîn/: ئاوەڵناو. لەکارزان؛ زانا لە کار ■ کاردان

**کاربینی** / karbînî/: ناو. کارزانی؛ پسپۆری ■ کاردانی

**کارپووچ**[1] / karpûç/: ☜ **کەرپووچ**

**کارپووچ**[۲]: ئاوەڵناو. هەڵەکار؛ تایبەتمەندی کەسێ کە کاری بێبەهرە دەکا ☰ سهوکار

**کارپیچ / karpîç/**: ☜ **کەرپووچ**

**کارپێچ / karpêç/**: ئاوەڵناو. زۆر خەریکی کار ☰ بسیار سرگرم کار

**کارپێک / karpêk/**: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی کەسێ کە جوان و ڕێکوپێک کار دەکا ☰ کاردُرُست

**کارپێکراو / karpêk(i)raw/**: ئاوەڵناو. دەکارکراو؛ بەکارهێنراو ☰ مصرف‌شده؛ مُستعمل

**کارپێکی / karpêkî/**: ناو. کارجوانی؛ ڕێکوپێکی لە کاردا ☰ باسلیقگی

**کارت / kart/**: ناو. ۱. ☜ **خێرۆك** ۲. کەرت؛ چارەک؛ بەشێک لە چوار پاژ ۳. پەتە؛ پسوولە ٤. ☜ **کارد** ☰ ۱. ☜ **خێرۆك** ۲. رُبع؛ یکچهارم ۳. کارت ۴. ☜ **کارد**

**کارت‌پوستاڵ / kartpustał/**: ناو. مقەبایەکی وێنە لە سەر چاپ کراو کە لە پشتییەوە دەنووسن و بە جێی نامە، بۆ جێژنەپیرۆزە و شاباش، بۆ یەکتری دەنێرن ☰ کارت‌پُستال

**کارتش / kartiş/**: چاوگ. چاندن؛ تۆم وەشاندن ☰ بذر افشاندن

**کارتک / kartik/**: ناو. مرمەند؛ بڕبەند؛ بڕوەن ☰ سوهان

**کارتمۆک / kart(i)mok/**: ☜ **کارتیمۆك**

**کارتمۆڵ / kart(i)mol/**: ☜ **کارتیمۆك**

**کارتنەک / kart(i)nek/**: ☜ **کارتێنك**

**کارتون / kartun/**: ☜ **کارتۆن ـ۲و۳**

**کارتۆ / karto/**: ئاوەڵناو. بەیات؛ پەزێرە؛ شەوپاتە (زۆرتر بۆ نان دەگوترێ) ☰ بیات (نان)

**کارتۆفڵ / kartofił/**: ☜ **کارتۆڵ**

**کارتۆڵ / kartoł/**: کارتێنە؛ کەرتوف؛ کەرتۆپە؛ کرتۆپل؛ کرتۆفل؛ کارتۆفل؛ کەرتۆفل؛ کرتوپ؛ کرکرووک؛ سێفەزەمینە ☰ سیب‌زمینی

**کارتۆن / karton/**: ناو. ۱. جەعبەی مقەبایی گەورە بۆ تێنانی کاڵا ۲. کارتون؛ ئەنیمەیشێن؛ فیلمی لە نەقاشی دروستکراو ۳. کارتون؛ چیرۆکی بە شێوەی کۆمەڵە نەقاشی ☰ ۱. کارتُن ۲و۳. کارتون

**کارتە / karte/**: ☜ **کاتە ـ۱**

**کارتەک / kartek/**: ☜ **کاردك ـ۲**

**کارتی**[۱] **/ kartî/**: ☜ **کارتیخ**

**کارتی**[۲]: ئاوەڵناو. پسوولەیی؛ پێویست بە کارت ‹تەلەفوونی کارتی› ☰ کارتی

**کارتیان / kart(i)yan/**: ناو. تاپوو؛ کەوار؛ کان؛ دەفری گڵینی گەورە، بۆ جێی گەنم و دانەوێڵە ☰ تاپو

**کارتیخ / kartîx/**: ناو. کاتیک؛ کارتی؛ کارتیک؛ کەرخیت؛ بڕبەندنی پچووک و نەرم ☰ سوهان کوچک و نازک

**کارتیس / kartîs/**: ناو. گیایەکە، ئاژەڵ بیخوا پێی دەمرێ ☰ گیاهی است

**کارتیغ / kartîğ/**: ☜ **کارتێ**

**کارتیک / kartîk/**: ناو. ۱. ☜ **کارتیخ** ۲. سەر ومسیەت؛ سەرەوگرد؛ قەویت؛ کەسێ کە پاش مردوو بە سەر ماڵ و منداڵیدا ڕادەگا ☰ ۱. ☜ **کارتیخ** ۲. قیّم

**کارتیمۆک / kartîmok/**: ناو. کاتمۆک؛ کارتمۆک؛ کارتمۆڵ؛ کارتیمۆڵ؛ قەوان؛ بابوونەی چاوەگا؛ گیایەکە گوڵێکی درشتی زەرد دەکا ☰ بابونەی گاوچشم

**کارتیمۆڵ / kartîmol/**: ☜ **کارتیمۆك**

**کارتێ / kartê/**: ناو. کارتیغ؛ بڕبەند؛ مرمەند؛ بڕەن؛ بڕوەن ☰ سوهان

**کارتێکدەر / kartêkder/**: ئاوەڵناو. مەڵۆشەوێنکە؛ مەڵۆشێوێن ☰ کاربەهم‌زن

**کارتێکەر / kartêker/**: ئاوەڵناو. کارکۆ؛ کاریگەر؛ کارلێکەر؛ کاری ☰ مؤثر

**کارتێکەری** / kartêkerî/: ناو. کاریگەری ☗ اثر؛ تأثیر

**کارتێنک** / kartênik/: ناو. کارتنەک؛ کارتێنە؛ جاڵجاڵووکە؛ جۆلاتەنە؛ کاکلەمووشان ☗ عنکبوت؛ تارتُنک

**کارتێنە** / kartêne/: ناو. ١. ☜ **کارتێنک** ٢. ☜ **کارتۆڵ**

**کارجف** / karcif/: ناو. دام و دەزگای هاوبەشی لە بازرگانیدا ☗ شرکت سهامی

**کارجوان** / karc(i)wan/: ☜ **شیرینکار**

**کارچف** / karçif/: ناو. هەلووچە؛ هەڵووژە ☗ آلو؛ آلوچە

**کارچک** / karçik/: ناو. هەرمێ؛ هەمرۆ ☗ گُلابی

**کارچو** / karçû/: ناو. کاچوو؛ چەقۆ ☗ چاقو

**کارچین** / karçîn/: ناو. جۆرێ هەرمێ کە بە کاڵی لێ دەکرێتەوە ☗ نوعی گُلابی

**کارخانە** / karxane/: ناو. کارخونە: ١. بەرهەمگە؛ شوێنێکی میکانیزە بۆ بەرهەم هێنانی کاڵا ٢. متبەخ؛ شوێنی چێشت لێنان لە ماڵ ٣. *[کینایە، ناشیرین]* کەرخانە؛ جندەخانە ☗ ١. کارخانە ٢. آشپزخانە ٣. فاحشەخانە

**کارخانەچی** / karxaneçî/: ناو. *[کینایە، ناشیرین]* دەویت؛ گەواد ☗ جاکش

**کارخراپ** / karx(i)rap/: ناوەڵناو. هەڵەکار ☗ گندکار

**کارخواز** / karx(i)waz/: ☜ **کارنیار**

**کارخونە** / karxune/: ☜ **کارخانە**

**کارخەزاڵ** / karxezal/: ناو. کارمامز؛ بەچکەئاسک؛ ئاسکۆڵە ☗ بچە آهو

**کارد** / kard/: ناو. کارت؛ کێرد؛ کەرنگ؛ تیخی بە دەسکی کورت و دەمی کانزایی تیژەوە ☗ کارد

⊡ **کارد و پەنیر بون:** *[مەجاز]* ئاگر و پووش بوون؛ مشک و پشیلە بوون؛ دوو دژمن و نەیاری یەک بوون بە جۆرێ کە یەکیان لە بەرامبەر ئەوی ترەوە خۆی پێ ڕاگیر نەبێ ☗ کارد و پنیر بودن

**کاردا** / karda/: ناو. ڕادەی کاری ئەنجامدراو ☗ کارکرد

**کاردار** / kardar/: ناوەڵناو. ١. بەرپرسی ڕامیاری دەوڵەتێک لە وڵاتێکی تر کە لە نەبوونی باڵیۆزدا کارەکانی بەڕێوە دەبا ٢. بەرانبەر بێکار ‹زانی چەن نەفەر هایمە یەی حەسار؟/ من ئووشم پەنجا، تو بووش پەنجاوچوار/ درێژ و کووتا، کاردار و بیکار «شامی»› ☗ ١. کاردار ٢. دارای کار و کاسبی

**کارداک** / kardak/: ناو. گەشتیار؛ وەشتار ☗ گردشگر

**کاردانک** / kardanik/: ناو. زێدان؛ پزدان؛ مناڵدان ☗ زهدان؛ رَحِم

**کاردانەوە** / kardanewe/: ناو. کار یان ڕەوتێک لە وەلامی کار یان ڕەوتێکی تردا ‹ئەم کارانە کاردانەوەی دەبێ› ☗ واکُنش

**کاردروس** / kard(i)rus/: ☜ **کاردروست**

**کاردروست** / kard(i)rust/: ناوەڵناو. کاردروس؛ کاردرووس؛ کارزان ☗ کاردان

**کاردرووس** / kard(i)rûs/: ☜ **کاردروست**

**کاردش** / kardiş/: چاوگ. ١. کردن؛ کرن ٢. سازدان؛ بەرهەڤ کرن ☗ ١. انجام دادن ٢. مُهیا کردن

**کاردک** / kardik/: ناو. ١. مرمەندی بچووک؛ برِبەندی گچکە ٢. کاردەک؛ کارتەک؛ تیغەیەکی کانزایی یان پلاستیکی دەمپان بۆ بلاو کردنەوە و ساوینی بەتانە و ڕەنگ و... ☗ ١. سوهانک ٢. کاردک

**کاردۆژە**[1] / kardoje/: ناو. کاردەوەژە: ١. کاری دار کۆڵین بە تیخ ٢. کەمکۆڵ؛ گوێزی تەڕ ☗ ١. کندەکاری چوب ٢. گردوی تر

⊡ **کاردۆژە کردن:** ١. گوێزی تەڕ هەڵکۆڵین ٢.

[مەجاز] هەڵکۆڵین و دەست تێوەردان 🇮🇷 ۱. در آوردن مغز گردوی تر ۲. دست در محتوای چیزی بُردن

**کاردۆژە**[۲]: ناوەڵناو. [کینایە] چلێس؛ زکەڕۆ 🇮🇷 شکمو

**کاردۆغە** / kardoxe/: ناو. وشەیەکە بۆ پووچ بوونەوەی شوومی دەڵێن 🇮🇷 اصطلاحی برای باطل کردن نحوست

**کاردوو** / kardû/: ناو. کاردی؛ کاری؛ هاز؛ هازە؛ هاس: ۱. کێردی؛ گیایەکی گەڵاپانە لە ئاوی سماقدا زەردی دەکەن و بە چێشتی لێ دەنێن ۲. تۆمی گیایەکە لە گەنم دەکا و ڕەنگی ڕەشە 🇮🇷 ۱. گیاهی است ۲. بذر گیاهی شبیه گندم

**کاردووەڕەشە** / kardûweřeşe/: ناو. جۆرێ گیای کاردوو 🇮🇷 گیاهی است

**کاردووەکوڕانە** / kardûwekuřane/: ناو. کاردووی بە نێرتک 🇮🇷 گیاهی است

**کاردووەمارانە** / kardûwemarane/: ناو. جۆرێ کاردووی خراپ 🇮🇷 گیاهی است

**کاردەپلە** / kardep(i)le/: ☜ **کاردەپەلە ـ۱**

**کاردەپەلە** / kardepele/: ناو. ۱. کاردەپلە؛ چەورووکە؛ تەیر ۲. نەخۆشی زیپکە دەرکردن لە سەرما 🇮🇷 ۱. بادخورک ۲. بیماری جوش زدن از سرما

**کاردەستی** / kardestî/: ناو. کاردەسی؛ دەسکار؛ پیتەوایەک کە بە دەست دروست کراوە 🇮🇷 کاردستی

**کاردەسی** / kardesî/: ☜ **کاردەستی**

**کاردەک** / kardek/: ☜ **کاردك ـ۲**

**کاردەوەژە** / kardeweje/: ☜ **کاردۆژە**[۱]

**کاردی** / kardî/: ☜ **کاردوو**

**کاردیتوو** / kardîtû/: ناوەڵناو. کاردیتی؛ کاردیدە؛ کاردییە؛ کارامە؛ کارەما؛ کەیکوا؛ ڕاهاتوو لە کاردا 🇮🇷 کارآزموده

**کاردیتی** / kardîtî/: ☜ **کاردیتوو**

**کاردیدە** / kardîde/: ☜ **کاردیتوو**

**کاردیکەردش** / kardîkerdiş/: ناو. وەستای چەقۆیان 🇮🇷 اُستادکار چاقوساز

**کاردینال** / kardînał/: ناو. مەتران؛ زانای ئایینی فەلە، پلەیەک خوارتر لە پاپ 🇮🇷 کاردینال

**کاردیۆگرافی** / kard(i)yog(i)rafî/: ناو. کار و ڕەوتی تۆمار کردنی شۆپی لێدانی دڵ لە سەر لاپەڕەی تایبەت 🇮🇷 کاردیوگرافی

**کاردییە** / kardîye/: ☜ **کاردیتوو**

**کارڕاست** / kařast/: ناوەڵناو. ۱. کاردروست؛ خاوەن ڕاستی و ڕوونی لە کاروباردا ۲. کار پێکهاتوو 🇮🇷 ۱. دُرُستکار ۲. بی‌مُشکل در کار

**کارزان** / karzan/: ناوەڵناو. کارامە؛ لەکارزان؛ فامیدە و لێهاتوو لە کار 🇮🇷 کاردان

**کارزانی** / karzanî/: ☜ **کارامەیی ـ۲**

**کارزۆر**[۱] / karzor/: ناو. بێگار؛ کاری زۆرەکی؛ **کاری** بەزۆری و بێ مز 🇮🇷 کار اجباری

**کارزۆر**[۲]: ناوەڵناو. پڕکار: ئـ) سەرقاڵی کارێکی تایبەت، بە شەو و بە ڕۆژ ب) خەریکی زۆر کارانی لە هەمە جۆرە 🇮🇷 پُرکار

**کارژ** / karj/: ناو. کاژ؛ توێژەمار 🇮🇷 پوستەای که مار می‌اندازد

**کارژۆڵە** / karjołe/: ناو. کار؛ کارژەڵە؛ کارژیلە؛ کارک؛ کاریلە؛ کاژیلە؛ کەهر؛ کەیر؛ کیەر؛ بەچکەبزنی ساوا 🇮🇷 بُزغاله

**کارژەڵە** / karjełe/: ☜ **کارژۆڵە**

**کارژیلە** / karjîle/: ☜ **کارژۆڵە**

**کارس** / kars/: ناو. ۱. زوراث؛ هەرزنە گەورە ۲. هەرزن؛ کارس؛ زڕاتەکێویلە 🇮🇷 ۱. ذُرّت ۲. ارزن

**کارساز**[۱] / karsaz/: ناو. ۱. کەسێ کار بۆ کەسێ پێک دێنێ ‹کارسازێکم نارد، کار بسازێنێ/ نەمزانی کارساز، کار ئەترازێنێ! «فولکلۆر»› ۲. [کینایە] خودا؛ خودێ؛ خوا 🇮🇷 ۱. کارساز ۲. خُدا

▣ **کارسازی کاران:** */کینایە/* بینایی چاوان؛ خودا؛ خوا ▤ خُدا

**کارساز**[2]: ئاوەڵناو. کارپێکهێن؛ کارڕێکخەر ▤ ردیف‌کنندەی کار و بار

**کارسازی / karsazî/:** ناو. ١. ڕەوتی پێکهێنانی کار ‹بە باشترین شێوە کارسازی کراوە› ٢. کار و ڕەوتی خۆ ئامادە کردن ▤ ١و٢. کارسازی

**کارساوێن / karsawên/:** ئاوەڵناو. */کینایە، پلار/* ١. تەمەڵ و تەوەزەل ٢. زمانلووس و فشەکەر ‹کارساوێنە وازی لێ بێنە!› ▤ ١. تنەلش ٢. چاپلوس

**کارستان / karistan/:** ناو. کاری گرنگ و بەرچاو ‹کارێکی کرد کارستان› ▤ کارستان

**کارسن / karsin/:** ناو. گارس؛ جاورس ▤ گاورس

**کارڤانکوژ / karvankuj/:** ☜ **کاروانکوژە**

**کارقایمی / karqay(i)mî/:** ناو. ئیحتیات ▤ مُحکم‌کاری

**کارک / kark/:** ☜ **کارگ–١**

**کارک**[1] **/ karik/:** ناو. ١. ☜ **شەکال** ٢. ☜ **کارژۆلە** ٣. کەندووی گڵینەی دانەوێڵە ٤. باریکەڕێ بۆ چوونە ناو باغچەی پەرژین‌کراو ▤ ١. ☜ **شەکال** ٢. ☜ **کارژۆلە** ٣. انبار گلی غلّه ۴. راه باریک به باغچه

**کارک**[2]: ئاوەڵناو. کاڵ؛ نەگەیشتوو ▤ کال

**کارکرد / karkird/:** ناو. دەور؛ کردەوە ▤ نقش

**کارکردە / karkirde/:** ئاوەڵناو. ١. کاردیدە ٢. دەکارکراو ▤ ١. کارآزمودە ٢. مُستعمل

**کارکری**[1] **/ kark(i)rî/:** ناو. قازانج لە سەودا ▤ سودِ معامله

**کارکری**[2]: ئاوەڵناو. ساز و ئامادە ▤ مُهیا

**کارکوشتە / karkuşte/:** ئاوەڵناو. کارامە؛ لێهاتوو ‹دیپلۆماتی کارکوشتە و بەئەزموون› ▤ کارکُشته

**کارکون**[1] **/ karkun/:** ناو. دەرمانی ڕەوان کردنی زگ ▤ داروی مُسهل

**کارکون**[2]: ئاوەڵناو. کارتێکەر؛ کاریگەر؛ کارکۆ ▤ اثربخش

**کارکۆ / karko/:** ئاوەڵناو. ١. کارتێکەر؛ کاریگەر ٢. کارا؛ کارامە ▤ ١. موثر؛ اثربخش ٢. کارا؛ فعال

**کارکەر / karker/:** ناو. ١. کەسێ کە کار دەکا ٢. ☜ **کارگەر** ▤ ١. کارکُن ٢. ☜ **کارگەر**

**کارکەنار**[1] **/ karkenar/:** ناو. وەنیشتە؛ خانەنشین؛ نیشتەبەر ▤ بازنشسته

**کارکەنار**[2]: ئاوەڵناو. وەلانراو؛ لە کار دەرکراو ▤ برکنار

**کارکەناری / karkenarî/:** ناو. ١. دانیشتەیی؛ دۆخی دانیشتە بوون لە کار ٢. نیشتەبەری؛ مووچەی هەڵپەسێراوی لە کا ▤ ١. بازنشستگی ٢. حقوق بازنشستگی

**کارکەو / karkew/:** ناو. ڕاوەکەوی بەکۆمەڵ لە بەفردا ▤ شکار گروهی کبک در برف

**کارگ / karg, karig/:** ناو. ١. کارک؛ کارۆک؛ کاڤیرک؛ کاڤیلک؛ کدارک؛ کڤارگ؛ کوارگ؛ کوراگ؛ کولافک؛ کومبەلۆک؛ کەڤارک؛ کەمبەلۆک؛ کەیارک؛ ڕووەکی بێڕەگ و قەد و گەلا و بێ ماکی کلوروفیل کە ناتوانێ بۆ خۆی خواردەمەنی دابین بکا، لە سەر لەشی زیندەوەر یان پاشماوەی مردوو، بە یارمەتی تیشکی خۆر، وەکوو باکتری و کەڕوو دەژی ٢. مریشک؛ مامر؛ کەرگ؛ کەرگی؛ کەرگە ▤ ١. قارچ ٢. مُرغ

▣ **کارگی کەما:** کارگی کوێستانە، کە لە سەر بنجی کەما هەڵدەتۆقێ ▤ قارچ کوهستانی

**کارگا / karga/:** ناو. کارگە؛ کارەگا؛ کارخانەیەکی چکۆلە کە زۆرتر خاوەن‌کاریش لەگەڵ کاریگەراندا کار دەکا ▤ کارگاه

**کارگوزار / karguzar/:** ناو. ڕێخەر؛ وێرت؛ فەرمانگوزار؛ سووورباش؛ زاوت؛ کارپێکهێنەری بەردەستی دەسەڵاتدار ▤ کارگُزار

**کارگە** / karge/: ☜ **کارگا**

**کارگەبەرسورکە** / kargebersûrke/: ناو. کارگێکـە لە نێو مێرگدا دەڕوێ و دەخورێ ⇐ نـوعی قـارچ خوراکی

**کارگەچی** / kargeçî/: ناو. پاڵەی کارخانە ⇐ کارگر کارخانە

**کارگەدارانـە** / kargedarane/: نـاو. کارگـــەدارە؛ کارگێکی تیژ و ژەهراوییە لـە سـەر کۆلکـەداری ڕزیو هەڵدەتۆقێ ⇐ قارچ درختی

**کارگەدارە** / kargedare/: ☜ **کارگەدارانە**

**کارگەر** / karger/: ناو. کارکەر؛ کرێکـار؛ کاریگـەر؛ کاریەر؛ مـەڕدا؛ فرمانکـەر؛ خەباتکـەر؛ خـەباتکار؛ پاڵە؛ یەرخات؛ شوولکەر؛ ئیشکەر؛ فەلە؛ عەمەلـە؛ کەسێ کە بە ئەنجامدانی کـار لـە کارخانـە یـان کارگایەک لە خاوەن‌کـار مووچـە وەردەگـرێ ⇐ کارگر

**کارگەری**[1] / kargerî/: نـاو. کرێکـاری: ۱. دۆخـی کرێکار بوون ۲. پیشەی کرێکار ⇐ ۱و۲. کارگری

**کارگەری**[2]: ئاوەڵناو. کرێکـاری؛ سـەر بـە کرێکـار ‹ڕێکخراوەی کارگەری› ⇐ کارگری

**کارگەفسە** / kargef(i)se/: نـاو. تسـەگورگ؛ فسـە گورگ؛ جۆرێ کارگی ژەهراوییـە ⇐ نـوعی قـارچ سمی

**کارگەگولانـە** / kargegulane/: نـاو. کارگەگولـــە؛ کارگی ژەهراوی ⇐ قارچ سمی

**کارگەگولە** / kargegule/: ☜ **کارگەگولانە**

**کارگی** / kargî/: ئاوەڵناو. قارچکی ⇐ قارچی

**کارگێڕ**[1] / kargêř/: ناو. کەسێ بە سەر کار و بـاری شوێنێکدا ڕادەگا ⇐ مدیر

**کـارگێڕ**[2]: ئاوەڵـناو. بەڕێوەبـەر ‹خـودا کارگێـڕە› ⇐ ادارەکنندە

**کارگێڕی**[1] / kargêřî/: ناو. ۱. فەرمانگـە؛ ئیـدارە ۲. کار و ڕەوتی کار و بار خستنەوە ڕێ ⇐ ۱. ادارە ۲. مُدیریت

**کـارگێڕی**[2]: ئاوەڵناو. ئیداری؛ سـەر بـە فەرمانگـە ⇐ اداری

**کارلێکەر** / karlêker/: ☜ **کارتێکەر**

**کارلێنـــەهاتـــو** / karlênehatû/: ئاوەڵـــناو. دەس‌بەستە؛ دەس‌بەسە ⇐ دست‌بسته؛ ناکارآمد

**کارم** / karm/: ☜ **کرم**[1]

**کارماخ** / karmax/: ناو. سـەرەند؛ سـەرەن؛ کـەو؛ خاکبێژ ⇐ سرند؛ غربال درشت

**کارمامز** / karmamiz/: ناو. بەچکە ئاسک ⇐ بچـە آهو

**کـارم دەکـەوتش** / karim dekewtiş/: ئاوەڵـناو. ۱. کرمـۆڵ؛ کـرم تـێ کـەوتوو ۲. *[پلار]* بـرێتی لـە تەمبەڵ و بێکارە ⇐ ۱. کرمو ۲. تنبل و بیکارە

**کارمژن** / karmijn/: ☜ **کرمەژن**

**کارمسەرا** / karmsera/: ☜ **کاروانسەرا**

**کارمسەرادار** / karmseradar/: نـاو. کاروانسـەرادار؛ خانچی ⇐ کاروانسرادار

**کارمەند** / karmend/: ناو. کەسێ کە لە مەزرینگە یان شەریکەیەکدا بە شێوەی بەردەوام کار دەکا و مانگانە (یان لە برێ وڵاتدا ساڵانە) مزێکی دیاریکراو وەردەگرێ ⇐ کارمند

**کارنـاس**[1] / karnas/: نـاو. فێرەکـار: ۱. کـارزان؛ کەسێ کە لە بواری فەننی یان زانستییەوە لێزانـە ‹کارناســی کشــتوکــاڵ› ۲. کارەمــا؛ هێکــار؛ ڕاسپاردەی ڕێکخراوەیـەک بـۆ پـێ‌ڕاگەیشـتن و تەگبیر لە بابەتێکی تایبەتی ‹کارناسی شـارەداری› ۳. لیسانسـە؛ کەسـێ کـە قۆنـاغی کارناسـی لـە زانستگا تێپەڕاندووە ⇐ ۱و۲. کارشناس ۳. لیسانسیە

**کارناس**[2]: ئاوەڵناو. ۱. دورناس؛ کارزان؛ لـەکـارزان؛ سەردەرچووگ؛ پسپۆڕ لە بواری کـار و زانسـتەوە ۲. خاوەن بڕوانامەی کارناسی ⇐ ۱و۲. کارشناس

**کارنـاسی** / karnasî/: نـاو. ۱. دۆخ یـان چۆنیـەتی

کارزان بوون لە بابەتێکی تایبەتدا ۲. لیسانس؛ قۆناغی خوێندەواری زانستگا، خوارتر لە ماستەر ☰ ۱و۲. کارشناسی

**کارنامە** / karname/: ناو. گۆڤاننامە: ۱. بڕوانامە؛ باوەڕنامە؛ بەرگەیەک کە نمرە و چۆنیەتی خوێندنی قوتابی تێدا نووسراوە ۲. ڕاپۆرتی نووسراو لە سەر کاری کەس یان دامەزراوەیەک ☰ ۱و۲. کارنامە

**کارناواڵ** / karnawał/: ☜ **کەرنەڤاڵ**

**کارنەزان** / karnezan/: ناوەڵناو. خەشیم؛ گەنەکار؛ غەشیم؛ ناشی؛ فێرەکار نەکراو ☰ ناشی

**کارنەکەر** / karneker/: ناو. تەمەڵ؛ ماتوڕە؛ ماتوڕا؛ تەمەڵ؛ تەوەزەل ☰ تنبل

**کارنیار** / karn(i)yar/: ناوەڵناو. کارخواز؛ خوازیاری کار ☰ خواهان کار

**کاروا** / karwa/: ☜ **کارەبا**

**کارواش** / karwaş/: ناو. ماشینشۆری؛ کارگەی خێرا شۆردنی ماشین ☰ کارواش

**کاروان** / karwan/: ناو. کاربان؛ کاروۆ؛ کاوران؛ کەروان؛ قافڵە ‹کاروان بە وەڕینی سەگ ناوەستێ «مەسەل»› ☰ کاروان

⊡ **کاروان کردن**: *[کینایە]* هاتوچۆ کردنی جار لە دووی جار لە شوێنێکدا ‹دوێشەو لەبەر مێزەچۆرتکێ، تا بەیانی کاروانم کرد!› ☰ آمد و شد متوالی در فضایی معین

**کاروانەشی** / karwanaşî/: ناو. چێشتی پیازاوی هێلکەتێکراو ☰ اشکنه

**کاروانچی** / karwançî/: ☜ **کاروانی**[1]

**کاروانسەرا** / karwansera/: ناو. کارمسەرا؛ جێگەی پشوودانی قافڵە ☰ کاروانسرا

**کاروانسەرادار** / karwanseradar/: ناو. خانچی؛ کارمسەرادار ☰ کاروانسرادار

**کاروانڤان** / karwanvan/: ناو. سەرقافڵە؛ سەرۆکی کاروان ☰ ساربان

**کاروانقڕان** / karwanq(i)řan/: ☜ **کاروانکوژە**

**کاروانکوژ** / karwankuj/: ناو. ۱. ☜ **کاروانکوژە** ۲. هەوێردە (مەلێکە) ☰ ۱. ☜ **کاروانکوژە** ۲. پرندەای است

**کاروانکوژە** / karwankuje/: ناو. کاروانکوژ؛ کارڤانکوژ؛ کاروانقڕان؛ ناهی؛ ناهید؛ زل؛ ئەستێرکە؛ ئەستێرەگەشە؛ قورخ؛ قورغ؛ مژمژ؛ زێرگۆن؛ هەسارەی ڕۆژ؛ ئەستێرەی ڕۆژێ؛ ئەستێرەی زوهرە کە لە ئاخری شەودا هەڵدێ ‹هەریەکەی بۆخۆی دەجووڵێنێتەوە هەستی دەروون/ زەردەپەڕ، کاروانکوژە، تاریکوڕوونی سوبحدەم «هێمن»› ☰ ستارەی سحری

**کاروانە** / karwane/: ناو. ۱. کەرەواڵە؛ کەرەوانکە؛ کەروان؛ پەلەوەرێ کە لە مراوی دەکا، دەندووکی خوارە و لە دەم ئاوان دەژی ۲. هاتوچۆ لە یەک جێگەدا ۳. *[شوورەیی]* کاری ژەنین کاتی هاوجێیی ٤. هەوایەکی گۆرانییە ☰ ۱. کاروانک ۲. آمدوشد در یک جای معین ۳. عمل کله زدن (در جماع) ۴. آهنگی است

⊡ **کاروانە پێ کردن**: *[شوورەیی]* ژەنین لە کاتی هاوجێیی کردندا ☰ کله زدن (در جماع)

**کاروانەڕێ** / karwaneřê/: ناو. شارێ؛ ڕێگای پان و گەورە ☰ بزرگراه

**کاروانی**[1] / karwanî/: ناو. کاروانچی؛ مرۆی ناو قافڵە ☰ کاروانی

**کاروانی**[2]: ناوەڵناو. پێوەندیدار یان سەر بە کاروان ‹توێشە و تفاقی کاروانی› ☰ کاروانی

**کاروبار** / kar û bar/: ناو. ۱. کار و داهاتی کار ‹بەرهەم بوو بە هۆی کر و نیگارت/ سەرسووڕە جیهان لە کاروبارت «هەژار، *مەم و زین*»› ۲. کار و کردەوە و ئاکار ‹کاروباری سیاسی؛ کاروباری کۆمەڵایەتی› ۳. کار، ئیش و پیشە ‹پەرێشان و کزم، بێکاروبارم/

بەبێ ڕاویش بە جارێک کوڵەوارم «هێمن»› ٤. ئەرک؛ بەرپرسی؛ بەرپرسایەتی ‹ئەمە کاروباری منە، تۆ حەقت نەبێ› ☰ ١. کاروبار ٢و٣. مشغله ٤. مسئولیّت

**کاروخا** / karuxa/: ناو. ئامرازێکە لە دەزگای جۆلاییدا ☰ از ابزار بافندگی

**کاروڕەهات** / kar û řehat/: 🖙 **کارەڕەهات**

**کاروس** / karus/: ناو. گیایەکی بۆنخۆشە ڕەگەڵ پەنیر دەخرێ ☰ گیاهی خوشبو که با پنیر می‌آمیزند

**کاروش** / karuş/: ناو. هەڵیتر؛ کاراس؛ کاریس ☰ گیاهی است

**کاروکاسبی** / kar û kas(i)bî/: ناو. کەسابەت؛ کسم و کار ☰ کاروکاسبی

**کاروۆ** / karwo/: 🖙 **کاروان**

**کارودەس** / karwedes/: 🖙 **کاربەدەست**

**کارۆک** / karok/: ناو. ١. 🖙 **کارگ ـ١** ٢. پۆلا؛ چلک؛ پەرەندا ☰ ١. 🖙 **کارگـ١** ٢. پولاد

**کارووس** / karûs/: ناو. وەعز؛ وتاری ئایینی ☰ موعظه

**کارە**[1] / kare/: ناو. ١. کاراک؛ کان؛ کانگە ٢. 🖙 **خێرۆك** ٣. 🖙 **کانگا ـ١** ☰ ١. معدن ٢. 🖙 **خێرۆك** ٣. 🖙 **کانگا ـ١**

**کارە**[2]: ئاوەڵناو. کاربەدەست ☰ کاربەدست

**• کارە**[3]: پاشەوشە. پێوەندیدار بە کارەوە ‹هیچکارە› ☰ ـ کاره

**کارەب** / kareb/: 🖙 **کارەبا**

**کارەبا** / kareba/: ناو. کارەب؛ کاروا؛ کارەوا؛ کارۆبا؛ کەرەب؛ کەرەبە؛ کەهرەبا؛ کاهرۆبا؛ کەهرۆبان: ١. جۆرێ جەوی وشکهەڵگەڕاو بە ڕەنگی زەردی کاڵە کە زۆرتر هەموو یان پاژێک لە لەشی مێروویەکی تێدا ساغ ماوەتەوە و مۆروو، مۆمەقەند، وردەخشڵ و تەزبێحی لێ دروست دەکەن ٢. بەرق ☰ ١. کهرُبا ٢. برق

**کارەبایی** / karebayî/: ئاوەڵناو. ١. زەردی ئاچخ و ڕۆشن؛ بە ڕەنگی کارەبا ٢. بەرقی ‹گەسکی کارەبایی› ☰ ١. کهرُبایی رنگ ٢. برقی

**کارەڕەهات** / kareřehat/: ناو. کاروڕەهات: ١. شەڕ و جنێوی زۆر ٢. چۆرتم؛ ڕووداوی ناخۆش ☰ ١. دعوا و دشنام زیاد ٢. رویداد ناگوار

**کارەسات** / karesat/: ناو. کارەڕەهات؛ کار و ڕەهات؛ گرگاشە؛ چۆرتم؛ کەت؛ تەمەرە؛ قەترەمە؛ ڕووشە؛ فەتارەت؛ تاوێر؛ کۆڵاو؛ هێلان؛ هەوتوویش؛ مەرگەسات؛ ڕووداوی زۆر ناخۆش و دڵتەزێن ‹کوردیش بەشداری خەبات بوو/ ڕۆڵەی ڕۆژی کارەسات بوو «هێمن»› ☰ فاجعه؛ رویداد ناگوار

**کارەساتاوی** / karesatawî/: ئاوەڵناو. تێکەڵ بە کارەسات ‹مێژووی کارەساتاوی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوین› ☰ فاجعه‌آمیز

**کارەساتبار** / karesatbar/: ئاوەڵناو. پڕکارەسات ‹ساڵێکی کارەساتبار؛ ناوچەی کارەساتبار› ☰ فاجعه‌آمیز؛ مصیبت‌بار

**کارەساتساز** / karesatsaz/: ئاوەڵناو. بە تایبەتمەندی کارەسات نانەوە ‹ڕووداوی کارەساتساز› ☰ فاجعه‌آفرین

**کارەک** / karek/: ناو. گندۆرە؛ کاڵەک ☰ خربُزه

**کارەکار** / karekar/: ناو. لاڵە؛ لاڤە؛ پاڕە ☰ لابه

**کارەکەر** / kareker/: ناو. کێرکار؛ کێرکەر: ١. قەرەواش؛ قەرواش؛ جێری؛ کڵفەت ‹کارەکەرم بمرێ، مشوورخۆرم نەمرێ «مەسەل»› ٢. [کینایە] کچ؛ کەنیشک ‹دوو کارەکەری تۆم هەیە› ☰ ١. کُلفت ٢. دختر

**کارەکەرە** / karekere/: ناو. کەسێ کە ئاتاجی ماڵ پێک دێنێ و بۆی ماندوو دەبێ ☰ نان‌آور خانه

**کارەگا** / karega/: 🖙 **کارگا**

**کارەما** / karema/: 🖙 **کاردیتو**

**کارەمو** / karemû/: ناو. تەنراو لە مووی بزن ☰

تافته از موی بُز

**کارەوا / karewa/**: ☜ **کارەبا**

**کارەوان / karewan/**: ناو. شوانی کارژیلان 🕮 بُزغالەچران

**کاری¹ / karî/**: ناو. ١. ☜ **کاردو** ٢. ئالات و زەردەچێوە ٣. گیایەکە لە دەم ئاو دەڕوێ و شیرەکەی ژەهرە 🕮 ١. ☜ **کاردو** ٢. ادویەجات ٣. گیاهی سمّی

▣ **کاریێ هەبێ**: عەمباری دەغڵ 🕮 سیلو

**کاریێ هەنگان**: پلوورەی هەنگ 🕮 کندوی زنبور عسل

**کاری²**: ئاوەڵناو. ١. بەکار؛ ئازا لە کار ٢. سەخت؛ دژوار ‹ئاخ چ دەردێکی گرانە بۆ گەلی کوردی هەژار/ قەت بە دەم ناکرێ بەیانی هێندە سەخت و کارییە «بێکەس»› ٣. کێڵدراو؛ گێلیاگ ٤. ☜ **کاریگەر²** 🕮 ١و٢. کاری ٣. کاشته شده ۴. ☜ **کاریگەر²**

**ـ کاری³**: پاشەوشە. ١. پێوەندیدار بە کارێکی دیاریکراو ‹گەنەکاری؛ شیرینکاری› ٢. کێڵی؛ کالّی ‹تەڕەکاری› 🕮 ١و٢. ـ کاری

**کاریت / karît/**: ناو. هەنگوین 🕮 عسل

**کاریتان / karîtan/**: ناو. کەنوو: ١. پلوورەمێش ٢. عەمارەی دەخڵ 🕮 ١. کندوی عسل ٢. انبار حبوبات

**کاریتە / karîte/**: ناو. گاریتە؛ شاتیر؛ دیرەک 🕮 بالار

**کاریتە پشت / karîtepişt/**: ناو. مۆغەرەی پشت؛ مرۆخەی پشت 🕮 ستون فقرات

**کاریس / karîs/**: ناو. کاروش؛ کاروس 🕮 گیاهی است

**کاریکاتور / karîkatur/**: ناو. وێنەی بە تیز کێشراوی کەس یان دیمەنێ کە بڕێک تایبەتمەندی و وردەکاری تێدا زەق کراوەتەوە 🕮 کاریکاتور

**کاریکاتوریست / karîkaturîst/**: ئاوەڵناو. لێهاتوو لە کاریکاتور کێشاندا 🕮 کاریکاتوریست

**کاریگەر¹ / karîger/**: ☜ **کارگەر**

**کاریگەر²**: ئاوەڵناو. کاری؛ کارتێکەر؛ کارکۆ. هەروەها: **کاریگەر بوون** 🕮 مؤثر؛ اثربخش

**کاریگەرانە¹ / karîgerane/**: ئاوەڵناو. کاریگەر؛ کارکۆ؛ کارتێکەرانە؛ کارلێکەر ‹بەشداری کردنی کاریگەرانە؛ دیالۆگی ڕاستەقینە و کاریگەرانە› 🕮 مؤثر

**کاریگەرانە²**: ئاوەڵکار. بە شێوەیەکی کاریگەر ‹زۆر کاریگەرانە قسەی کرد› 🕮 تأثیرگُذار

**کاریگەری / karîgerî/**: ناو. کار و ڕەوتی کار تێ کردن؛ کار لێ کردن؛ کاریگەر بوون 🕮 تأثیر

**کاریلە / karîle/**: ☜ **کارژۆڵە**

**کارین / karîn/**: چاوگ. کانین؛ توانین؛ تاقەت هێنان ‹ئەز کارم تە نکاری› 🕮 توانستن؛ تاب آوردن

**کارینای / karînay/**: ئاوەڵناو. دەکارکراو؛ کۆنبوو 🕮 کارکرده؛ مُستعمل

**کاریەر / karyer/**: ☜ **کارگەر**

**کارێچ / karêc/**: ناو. شەنە؛ شەن 🕮 افشون

**کارێچ / karêç/**: ناو. ملهێب؛ مالێب؛ شەنەی خەرمان بادان 🕮 افشون

**کارێز / karêz/**: ناو. کارێزە؛ کەهرێز؛ کەهرێز؛ کەرێز؛ کەرێزە؛ نهون؛ نوهین؛ نهوین؛ ڕێگەی ئاوی بە ژێر زەویدا کێشراو ‹دیسان بارانە ڕێزە بە ڕێزە/ دایمە چاوێکم لە ڕێی کارێزە «فولکلۆر»› 🕮 قنات

▣ **کارێز لێدان**: کارێز دروست کردن 🕮 حفر کردن قنات

**کارێزاو / karêzaw/**: ناو. ١. ئاوێ کە لە کارێزەوە دێت ٢. *[کینایە]* ئاوی فێنک و سووک 🕮 ١. آب قنات ٢. آب خُنک و گوارا

**کارێزکەن / karêzken/**: ناو. کارێزهەڵکەن؛ کارێزەکەن؛ کەسێ کە کارێز لێدەدا 🕮 مُقنّی

**کارێزە / karêze/**: ☜ **کارێز**

**کارێزه‌که‌ن** / karêzeken/: ☜ **کارێزکه‌ن**

**کارێزهه‌ڵکه‌ن** / karêzhełken/: ☜ **کارێزکه‌ن**

**کارێل** / karêl/: ناو. *[ناشیرین]* گه‌واد؛ ده‌یووس؛ کوسکه‌ش ☳ جاکش

**کاڕاد** / kařad/: ☜ **که‌وه‌ر ـ١**

**کاڕاژ** / kařaj/: ☜ **گاراج**

**کاڕگه** / kařge/: ناو. کاڕگی؛ مریشک؛ مامر ☳ مُرغ

**کاڕگی** / kařgî/: ☜ **کاڕگه**

**کاڕوبا** / kařuba/: ☜ **کاره‌با**

**کاڕوش** / kařuş/: ناو. ١. گیایه‌که له هه‌رزن ده‌کا ٢. په‌لکی شینی پیاز و سیر (بێ سه‌لک) ☳ ١. گیاهی شبیه ارزن ٢. ساقه‌ی سبز پیاز و سیر

**کاڕ و کوڕ** / kař û kûř/: ده‌نگه‌ناو. کاڕه‌کووڕ؛ ده‌نگی باڕاندنی په‌ز ‹چ خۆشه کاڕوکووڕی مه‌ڕ، چ خۆشه پڕمه‌که‌ی که‌حلان/ چ خۆشه فیته‌فیتی شوان، چ خۆشه ئۆحه‌که‌ی گاوان «هێمن»› ☳ صدای گوسفندان

**کاڕه** / kaře/: ده‌نگه‌ناو. ده‌نگی مه‌ڕان ☳ صدای گوسفندان

**کاڕه‌کاڕ** / kařekař/: ده‌نگه‌ناو. کاڕه‌ی له‌ دوای یه‌کی مه‌ڕان؛ ده‌نگی مێگه‌ل ‹نه کاڕه‌کاڕی مه‌ڕی دێ نزیکی چێشتانان/ نه حیله‌حیلی که‌حێلان له‌ ده‌شت و مه‌زرایه «حه‌قیقی»› ☳ صدای پیاپی گوسفندان

**کاڕه‌کوڕ** / kařekûř/: ☜ **کاڕوکوڕ**

**کاڕه‌نگ** / kařeng/: ناو. زه‌ردی ڕۆشن؛ به‌ ڕه‌نگی کا ☳ زرد کاهی

**کاڕێژ** / kařêj/: ناو. ١. قولی سه‌ربانی کادان که‌ له‌وێوه کا ده‌ڕێژنه ناو کادانه‌وه ٢. ☜ **گاراج** ٣. جه‌مسه‌ری شه‌ویلاکه ٤. شه‌نه؛ شه‌ن ☳ ١. سوراخ بام کاهدان برای ریختن کاه ٢. ☜ **گاراج** ٣. مفصل آرواره‌ها ۴. افشون

**کاز** / kaz/: ☜ **که‌وێڵ ـ١**

**کازتین** / kaztîn/: ☜ **کازین**

**کازکاز** / kazkaz/: ناو. ١. کاری نالاندن ٢. کاری ده‌ردی دڵ کردن ٣. لووره؛ نه‌کوچ ☳ ١. عمل نالیدن ٢. عمل درد دل کردن ٣. زوزه

**کازکازه** / kazkaze/: ناو. هه‌وای گۆرانی و قام و لاوکی زۆر خۆش ☳ ترانه‌ی شاد

**کازوکوز** / kaz û kûz/: ☜ **کازیوه**

**کازه** / kaze/: ناو. کایه و شۆخی ☳ سرگرمی و شوخی

**کازین** / kazîn/: چاوگ. کازتین؛ هه‌را و هاوار کردن ☳ داد و فریاد کردن

**کازینۆ** / kazîno/: ناو. قومارخانه؛ چه‌شنێک هوتێل یان چێشتخانه که‌ ژووری تایبه‌ت به‌ قوماری تێدایه ☳ کازینو

**کازیوه** / kazîwe/: ناو. کازێوه؛ کازوکووز؛ بووڵێڵه‌ی به‌یان ☳ سپیده‌دم؛ فجر کاذب

**کازیه** / kaz(i)ye/: ناو. ئه‌سبابێکی دوو ـ سێ ته‌به‌قه‌ی کانزایی یان په‌لاستیکی، له سه‌ر مێزی داده‌نێن و کاغه‌ز و به‌ڵگه‌ی به‌رده‌ستی تێ ده‌چنن ☳ کازیه

**کازێوه** / kazêwe/: ☜ **کازیوه**

**کاژ** / kaj/: ناو. ١. توێژه مار ٢. تۆژگ؛ تۆی بان شیر و ماست ٣. تێکوڵی پێست ٤. ☜ **کاج ـ١** ٥. قڕقڕه‌ی ده‌زوو ٦. تیشه شاخ ☳ ١. پوسته‌ای که مار می‌اندازد ٢. چربی روی شیر و ماست ٣. قشر نازک پوست ۴. ☜ **کاج ـ١** ۵. قرقره ۶. کوه سنگی

▣ **کاژ خستن:** ١. داکه‌وتنی تێکڕای پێستی هه‌ندێ گیانله‌به‌ر وه‌کوو مار که‌ زۆرتر ساڵێ جارێ ڕوو ده‌دا و پێستی تازه جێی ده‌گرێته‌وه ٢. *[کینایه، پلار]* ڕواڵه‌ت گۆڕین و شاردنه‌وه‌ی تاوان و گه‌نده‌کاریی پێشوو ‹حیزبه‌کان کاژیان خستووه و ئێستا هه‌موو دلسۆزی خه‌ڵکن!› ☳ ١. پوست انداختن ٢. چهره عوض کردن

**کاژ**[۲]: ناوەڵناو. خوێل؛ چاوخێل ☰ دوبین؛ لوچ

**کاژ**[۳]: پێرۆ. ← **هاژوکاژ**

**کاژاو / kajaw/**: ناو. ۱. کاژاوی؛ دارستانی کاج ۲. زەڵم؛ توێژی سوور لە سەر ئاو ۳. جۆرێ ترێ ☰ ۱. کاجستان ۲. لایەی قرمز بر آب ۳. نوعی انگور

**کاژاوی / kajawî/**: ناو. ۱. ☜ **کاژاو ـ۱** ۲. جۆرێ ترێ ڕەشکە ☰ ۱. ☜ **کاژاو ـ۱** ۲. نوعی انگور سیاه

**کاژمار / kajmar/**: ناو. تفرەمار ☰ پوستەی مار

**کاژمێر / kajmêr/**: ☜ **کاتژمێر**

**کاژە / kaje/**: ناو. ۱. بنەی کاروان لە دەشت ۲. ڕەبەت؛ بۆسەی ڕاوچی ۳. کەوەک؛ بێچووەهەنگ ٤. ☜ **کاژەڵە** ☰ ۱. کازە؛ اُتراق‌گاهِ کاروان ۲. کمین شکارچی ۳. زنبور عسل نابالغ ۴. ☜ **کاژەڵە**

**کاژەڕە / kajeře/**: ☜ **کاژەڵە**

**کاژەلاک / kajełak/**: ☜ **کاژەڵە**

**کاژەڵە / kajełe/**: ناو. کاژەڕە؛ کاژەلاک؛ کاژە؛ کەللە؛ کاپۆڵ؛ قەحەف ☰ جُمجُمه

**کاژەنگ / kajeng/**: ناو. بژار؛ وژن؛ ناوەژیە ☰ وجین

**کاژی / kajî/**: ناو. پەردەی نازکی ناو دەروون ☰ غشاء

**کاژیلە / kajîle/**: ☜ **کارژۆڵە**

**کاژێر**[۱] **/ kajêr/**: ناو. ۱. شەویلاکە؛ شەویلکە؛ شەویل ۲. سووچ و قوژبنی ئۆدە ۳. تاقە لە دیواردا ٤. ئۆدەی خەڵوەت لە تەکیەدا ☰ ۱. آرواره ۲. گوشه و زاویەی اتاق ۳. تاقچە ۴. زاویەی تکایا

**کاژێر**[۲]: ناوەڵناو. *[کینایە، شوورەیی]* ڕەحەت بوو لە هاوجێییدا (بۆ پیاو) ☰ ارضاشده در جماع

**کاژێرە / kajêre/**: ☜ **کاخڵی**

**کاژێری / kajêrî/**: ناو. *[کینایە، شوورەیی]* ڕەوتی ڕەحەت بوون؛ ئاو هاتنەوە ☰ انزال منی

**کاژێڕ / kajêř/**: ناو. کوویژرک؛ قوژبن؛ سووچ؛ قولینچک ☰ گوشه؛ زاویه

**کاژێڵە / kajêłe/**: ☜ **کاخڵی**

**کاس**[۱] **/ kas/**: ناو. ۱. زەرک؛ تاس؛ قاپ؛ جام ۲. بناری کێو ۳. هەوراز؛ ئەوراز ☰ ۱. کاسە ۲. دامنەی کوە ۳. ارتفاعات

**کاس**[۲]: ناوەڵناو. ۱. گێژ؛ وڕ؛ سەرتاساو ‹مەگەر مەیخانەیە دنیا، کەوا کاسی لە بەر کەئسی/ بە نەغمەی عوودی سووتاوی، بە نەشئەی تاسی تاساوی! «نالی»› ۲. کەڕ؛ هیچنەبیس ‹شایی دانێن، دەیکەین بە شین/ پرسە دانێن، کاستان دەکەین بە پێکەنین! «پەشێو»› ۳. قووڵ؛ ڕۆچوو ☰ ۱. گیج و منگ ۲. ناشنوا ۳. گود

⊡ **کاس بون/ بین**: تاسیان؛ وڕ بوون. هەروەها: **کاس کردن** ☰ گیج شدن

**کاسالاشینکە / kasałaşînke/**: ☜ **کاسەڵەشینکە**

**کاساوسا / kasawsa/**: ☜ **کاسەئاوسا**

**کاسب**[۱] **/ kasib/**: ناو. کاسبکار؛ پیشەوەر؛ مامڵەچی؛ کەسێ کە ژیانی بە کڕین و فرۆشتنەوە بە ڕێوە دەچێ ☰ کاسب

**کاسب**[۲]: ناوەڵناو. زرینگ و وریا لە کاسبیدا ‹پیاوێکی کاسبە› ☰ کاسب

**کاسبکار / kasibkar/**: ☜ **کاسب**[۱]

**کاسبی / kas(i)bî/**: ناو. کاسوی: ۱. پیشەی کاسبکار ‹لەم گرانییەدا کاسبی حەلاڵ نەماوە› ۲. کاری کاسبکار ‹ئەم ڕۆژانە کاسبییەکەی هیچی تێدا نییە› ☰ ۱و۲. کاسبی

**کاستین / kastîn/**: چاوگ. ۱. لوورانەدن؛ زیرانەدن ۲. قروسکاندنی سەگ ☰ ۱. زوزه کشیدن ۲. نالیدن سگ

**کاسک / kasik/**: ناو. ۱. تاسی چکۆڵە ۲. کوویی باکێشی حەجامەت ☰ ۱. کاسەی کوچک ۲. بادکش حجامت

**کاسمە / kasme/**: ناو. نانێ کە هەویرەکەی بە ڕۆنەوە شێلدرابێ ☰ نوعی نان روغنی

**کاسنەیەرە / kasneyere/**: چاوگ. داسەکناندن ☰ آرام کردن

**کاسنی / kasnî/**: ناو. چەقەنە؛ چەقچەقە؛ چەقچەقۆک؛ چەکچەکیلە؛ چەقەنەک؛ هندووبا؛ گیاشیلاو؛ شیرەچاو؛ ئالفەگیایەکی گەلابلاوی گوڵشین، سپی یان سوورکاڵە، بن و گەڵا و گوڵ و تووەکەی دەرمانە ☰ کاسنی

**کاسول / kasul/**: ئاوەڵناو. ١. شەکەت؛ ماندوو؛ مانگ ٢. *[بلار]* تەمەڵی دەستوپێ سپی ☰ ١. خستە و کوفتە ٢. تنبلِ بیکارە

**کاسوی / kasuy/**: ☜ کاسبی

**کاسۆ[1] / kaso/**: ناو. قاشۆ؛ کاشۆ؛ داری سەرخواری گۆبازی ☰ چوگان گوی بازی

**کاسۆ[2]**: ئاوەڵناو. هەژار؛ فەقیر ☰ بینوا

**کاسۆتی / kasotî/**: ئاوەڵناو. بەتاسە؛ ئارەزوومەن؛ ئاواتخواز ☰ آرزومند

**کاسۆخ / kasox/**: ☜ کەرەنتوو

**کاسۆلە / kasole/**: ئاوەڵناو. گەوج؛ نەفام ☰ ابلە

**کاسوولکە / kasûlke/**: ناو. ١. قووڵکەی چاو؛ کاسەی چاو ٢. کاسەی بچووک ☰ ١. کاسەی چشم ٢. کاسەی کوچک

**کاسوولی / kasûlî/**: ناو. قسوور؛ قوسوور؛ کۆتایی؛ درێخی ☰ قصور

**کاسە / kase/**: ناو. ١. کاس؛ زەرک؛ تاس؛ قاپ؛ قاو؛ جام؛ جۆم؛ ترارک؛ بادی؛ بادیە؛ بایە؛ باییە؛ جامۆڵە؛ وسکورا؛ دەفری دەمتاکی چێشت و تراوی تر تێ کردن ٢. جام؛ شتی ناو دەفر ‹کاسەیەک ماشی هێنابوو› ٣. هەر شتێکی دەفرئاسا ‹کاسەی چاو› ☰ ١تا٣. کاسە

▣ **کاسەی ئەژنۆ**: ☜ کەشکەزرانی

**کاسەی چاو**: قووڵکەی چاو ☰ کاسەی چشم

**کاسەی زرانی**: ☜ کەشکەزرانی

**کاسەی سمت**: قوولایی نێوان پشت و ڕان ☰ لگن خاصرە

**کاسەی سەر**: کەللە؛ کاپۆڵ ☰ جُمجُمە

**کاسەئارد / kase'ard/**: ناو. مزراق بە سەر مزراقا کوتان لە زاراوی منداڵاندا ☰ اصطلاحی در گردنابازی کودکان

**کاسەئاسوێ / kase'aswê/**: ☜ کاسەئاوسا

**کاسەئاوسا / kase'awsa/**: ناو. کاساوسا؛ کاسەئاسوێ؛ کاسەمسا؛ شێو بۆ جیران ☰ غذای تقدیمی به همسایه

**کاسەئەژنۆ / kase'ejno/**: ☜ کەشکەزرانی

**کاسە پشت / kasepişt/**: ☜ کیسەڵ

**کاسەجەژن / kasecejn/**: ☜ کاسەجەژنان

**کاسەجەژنان / kasecejnan/**: ناو. کاسەجەژن؛ کاسەجێژنان؛ چێشتی تایبەتی بۆ ڕۆژی جەژن ‹ئەم جەژنە کاسەجەژنانمان نییە› ☰ غذای ویژەی عید

**کاسەجێژنان / kasecêjnan/**: ☜ کاسەجەژنان

**کاسەچەش / kaseçeş/**: ناو. قاپێلکی چاو؛ کاسەی چاو ☰ کاسەی چشم

**کاسەزرانی / kasez(i)ranî/**: ☜ کەشکەزرانی

**کاسەسفرە / kasesifre/**: ناو. خۆراکێ کە بۆ ئاوسای تازە هاتوو دەنێردرێ ☰ خوراکی که برای همسایەی نورسیده می‌فرستند

**کاسەسم / kasesim/**: ناو. پشتی سمی چارەوێ ☰ کاسەی سُم ستور

**کاسەسەر / kaseser/**: ناو. کەللە؛ پێشەی سەر ☰ جُمجُمە

**کاسەشۆر / kaseşor/**: ناو. ١. گیایەکی گەلاپان و زبرە ٢. ئیسکاج؛ دەفرشۆر؛ زروە ٣. ماشێنی کارەبایی تایبەت بۆ شۆردنی قاپ و قاچاغ ٤. قاپشۆر؛ ئەوی دەفر و ئامان دەشۆرێتەوە ☰ ١. گیاهی است ٢. اسکاج؛ سیم ظرفشویی ٣. ماشین ظرفشویی ۴. کارگر ظرفشور

**کاسەشەن** / kaseşen/: ناو. بێڵی دارینی خەرمان تێک وەردان 🇮🇷 پاروی چوبی ویژەی خرمن

**کاسەکەر** / kaseker/: ناو. ئیربارکەر؛ هەوڕگەر ‹ئەم کاسەسەرانەی کە دەبینی سۆزی/ ژێر قاچ و قولی کاسەکەران ڕادەخرێ «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› 🇮🇷 سُفالگر

**کاسەکەل** / kasekel/: ناو. ئەشکەولەت 🇮🇷 کوزەشکستە

**کاسەکەو** / kasekew/: ناو. سوێسکە؛ تەیهوو 🇮🇷 تیهو

**کاسەگوڵ** / kaseguł/: ناو. دەرمان‌دڵە؛ وەرەگیا؛ نێوی گیایەکە لە تیرەی ڕکێشە 🇮🇷 گل انگشتانە

**کاسەلێس** / kaselês/: ناوەڵناو. *[پلار]* ١. چەورە و چڵێس ٢. خۆفرۆش بە بێگانە 🇮🇷 ١. سورچران ٢. خودفروختە

**کاسەڵکەشینکە** / kasełkeşînke/: ☜ کاسەڵەشینکە

**کاسەڵکەشینە** / kasełkeşîne/: ☜ کاسەڵەشینکە

**کاسەڵە** / kasełe/: ناو. سوێسکە 🇮🇷 تیهو

**کاسەڵەشینکە** / kasełeşînke/: ناو. کاسەڵەشینە؛ کاسالاشینکە؛ کاسەڵکەشینکە؛ کاسەڵکەشینە؛ کاشەڵەشینکە؛ کاشەڵەشینە؛ قیژۆک؛ خومەڕژە؛ خومەڕشکە؛ خومەڕەژە؛ خومەڕەژگە؛ خومەڕەشکە؛ خومەڕێژە؛ خومەشینکە؛ گونجگیر؛ حەوتڕەنگیلە؛ سووروەکەوا؛ سەوزکۆ؛ قراکەسەوزە؛ ئەسپەشینە؛ بۆگەنە؛ تۆرەمە باڵندەیەکن وەک قەلەبەڵەکە دەچن، لەشیان نزیک ٣٠ سانتی‌میتر دەبێ، ڕەنگاوڕەنگن، دەندووکیان ئەستوور و قاچیان بەهێزە، لە شوێنی بەرز هەڵدەنیشن، بە تەنیا دەژین، لە کوناندا هێلانە ساز دەکەن. دوو جۆریان هەیە: کاسەڵەشینکە و کاسەڵەشینکەی هیندی 🇮🇷 سبزقبا

**کاسەڵەشینە** / kasełeşîne/: ☜ کاسەڵەشینکە

**کاسەمسا** / kasemsa/: ☜ کاسەئاوسا

**کاسەمەن** / kasemen/: ناو. کاسەی پێوانەی کڕین و فرۆشتن 🇮🇷 کاسەی پیمانەی خرید و فروش

**کاسەوکەوچک** / kase w kewçik/: ناو. دەفر و ئامانی سەر سفرە 🇮🇷 لوازم و ظرف و ظروف غذاخوری

**کاسی** / kasî/: ناو. تاساوی؛ وڕی 🇮🇷 گیجی

**کاسینۆک** / kasînok/: ناو. سیقڵدان؛ جیقڵدان؛ چینەدانی باڵندە 🇮🇷 چینەدان مرغ

**کاسیەیەرە** / kas(i)yeyere/: چاوگ. داسەکیان 🇮🇷 آرام گرفتن

**کاسێت** / kasêt/: ناو. ١. قاپێکی بچووکی پەلاستیکی بۆ ڕاگرتن و هەڵکردنی شریتی دەنگ یان وێنە ٢. قاپۆلکە؛ قاپیلکە؛ قاپلۆخ؛ بەرگی زۆرتر ڕەق و ئەستووری ڕاگر و پارێزەری هەر شتێک 🇮🇷 ١و٢. کاست

**کاش**[1] / kaş/: ناو. ١. شوێن پێ لە ناو زرعاتدا ٢. زرعاتی بە پێ شکاو ٣. شیشی گۆشتی براشتی ٤. شێو؛ کاری کێلانی زەوی ٥. زەوی بەیار ٦. گرد؛ تەپۆڵکە ٧. کێش؛ ڕاکێش؛ ڕاکشی ٨. پاسارە؛ سوانە؛ گوێسوانەی خانوو ٩. تیشە شاخ ١٠. خشکە؛ ڕەوتی خزین و خوشین بە سەر زەویدا ١١. سەرەولێژی ڕژد ١٢. هەورازی کووڕ و ڕژد ١٣. کاژ؛ توێخ؛ پێستی هەرە ناسک ١٤. کاژ؛ توێژە مار ١٥. بەروار؛ قەدی کێو 🇮🇷 ١. ردپا در کشتزار ٢. سبزەی پامال شدە ٣. سیخ کباب ۴. شُخم ۵. زمین بایر ۶ تل؛ تپەی کوچک ۷. کشش ۸ لبەی بام ۹. کوە سنگی ۱۰. خزش ۱۱. شیب تُند ۱۲. بلندای دشوارگُذر ۱۳. پوستەی نازک ۱۴. پوست افتادەی مار ۱۵. کمر کوە

◘ **کاش کردن**: ١. ڕاکێشان بە سەر زەویدا ٢. کێلانی زەوی 🇮🇷 ١. بر زمین کشیدن ٢. شخم زدن

**کاش کرن**: ڕاخوشـین بـه زەویـدا ⇐ بـر زمـین خزیدن

**کاش**[٢]: ☜ **کاشکا**

**کاش**[٣]: پێرۆ. ← **کردوکاش**

**کاشـان** / kaşan/: چـاوگ. شـوێن گێـڕان؛ بـه نیشانەی جێگه پادا چوون و دۆزینەوه ⇐ ردگیری کردن

**کاشت** / kaşt/: ناو. کاڵ؛ کار؛ کـار و ڕەوتی چانـدن ⇐ کاشت

**کاشتن** / kaştin/: چاوگ. کێلان؛ نیان ⇐ کاشتن

**کاشتی** / kaştî/: ئاوەڵـناو. چێنـدراو؛ چانـدراو ⇐ کاشته

**کاشخانک** / kaşxanik/: ناو. سرمیچ؛ میچی خـانوو ⇐ سقف

**کاشک** / kaşk/: ناو. هەڵاشی خانوو ⇐ انبیره

**کاشکا** / kaşka/: سارسته. کاش؛ کاشکان؛ کاشکای؛ کاشـکایه؛ کاشـکایەکوو؛ کاشـکایەکی؛ کاشـکی؛ خۆزگا؛ بریا ⇐ کاشکی

**کاشکان**[١] / kaşkan/: ناو. ١. پێڵاوی خلیسـکێن ٢. یاریزانی خلیسکێنێ ⇐ ١. کفش اسکی ٢. اسکی‌باز

**کاشکان**[٢]: ☜ **کاشکا**

**کاشکای** / kaşkay/: ☜ **کاشکا**

**کاشکایه** / kaşkaye/: ☜ **کاشکا**

**کاشکایەکو** / kaşkayekû/: ☜ **کاشکا**

**کاشکایەکی** / kaşkayekî/: ☜ **کاشکا**

**کاشکەردۆخ** / kaşkerdox/: نـاو. ڕاکێشەر بـه سـەر زەویدا ⇐ کشاننده بر زمین

**کاشکی** / kaşkî/: ☜ **کاشکا**

**کاشمه** / kaşme/: نـاو. کاشمەر؛ گیایەکی چـەتری بۆنخۆش به گەڵای وەک پەنجـەی قـاز، چـەتره گوڵی سپی، بەری خڕی هێلکەیی بۆنخۆشەوه ⇐ جعفری کوهی

**کاشمەر** / kaşmer/: ☜ **کاشمه**

**کاشنگ** / kaşing/: ناو. توربەی ئالف کـه بـه سـەر دەوارییەوه دەکەن ⇐ توبرەی علف

**کاشوانێ** / kaşwanê/: ناو. بازی به کاشۆ ⇐ چوگان

**کاش‌وکوش** / kaş û kûş/: نـاو. سـەرەولێژی ڕژد؛ سەربەرەوخوارەی تون ⇐ شیب تُند

**کاشۆ** / kaşo/: نـاو. ١. ☜ **کاشـو** ٢. تووره‌کـەی سەری وڵاخ ٣. دوو داری ناو باز بۆ قـایم کـردنی بار ⇐ ١. ☜ **کاشو** ٢. توبره ٣. دو چوبی کـه بـار را بدان مُحکم کنند

**کاشۆبازی** / kaşobazî/: نـاو. حـەچان؛ گـۆیێن؛ شـەقێن؛ گـۆیێن؛ گەمـەی گـۆ و گۆچـان ⇐ چوگان‌بازی

**کاشو** / kaşû/: ناو. کاشۆ؛ قاشۆ ⇐ چوگان‌بازی

**کاشور** / kaşûr/: نـاو. گیایەکـه گـەڵا دانـەدار بـه شلکی دەخورێ ⇐ گیاهی خوردنی

**کاشول** / kaşûl/: ناو. ١. *[کنایه]* پێسـت؛ پـۆس ٢. سواڵـەتی سـەربان داپۆشـین ٣. قاشـووله؛ لەتـه سواڵەت ⇐ ١. پوست ٢. سُفال بام ٣. تکه سُفال

**کاشولکه** / kaşûlke/: نـاو. قاشـوولکه؛ قاشـوون؛ کاشوون؛ لەته سواڵەت ⇐ تکه سُفال

**کاشه** / kaşe/: ناو. ١. گاریه؛ پـەڕەی نـاو پێچکـی عەرابه ٢. ئامرازی گواسـتنەوەی سـەر بـەفر کـه بێ‌پێچکەیه و ڕایدەکێشن ⇐ ١. پرّەی چرخ گـاری ٢. سورتمه

**کاشه‌ڵەشینکه** / kaşełeşînke/: ☜ **کاسه‌ڵەشینکه**

**کاشه‌ڵەشینه** / kaşełeşîne/: ☜ **کاسه‌ڵەشینکه**

**کاشەمه** / kaşeme/: ناو. سالیۆن؛ کاشمه ⇐ کرفس کوهی

**کاشی** / kaşî/: نـاو. ١. کاسەی ڕەنگ و لەعاب لـێ دراو ٢. خشتی ناسکی ڕەنگاوڕەنگ ⇐ ١. کاسەی لعابی ٢. کاشی

**کاشیکاری** / kaşîkarî/: نـاو. ١. کـاری داپۆشـان و خەملانـدنی ڕووپـەڕێک بـه کاشـی ‹خـەریکی

کاشیکاری حەمامین› ٢. ڕووپەڕێک کە بە کاشی داپۆشراوە ‹ئاشپەزخانە تا بنمیچ کاشیکاری کراوە›
هەروەها: **کاشیکار** ☰ ١و٢. کاشیکاری

**کاشیکان** / kaşîkan/: ناو. ١. پێلاوی خلیسکێن ٢. خلیسکێنکەر ☰ ١. کفش اسکی ٢. اسکی‌باز

**کاشێل** / kaşêl/: ناو. کار و ڕەوتی کاشان؛ شوێن گێڕان ☰ ردیابی

**کاغز** / kaxiz/: ☜ **کاغەز**

**کاغەز** / kaxez/: ناو. قاغز؛ قاغەز؛ قاقز؛ قاقەز؛ قاگەز؛ کاغز؛ کاگەز: ١. لاپەڕەیەک زۆرتر لە هەویری هەودای گیایی بۆ لەسەر نووسین ٢. نامە؛ پسوولەی نووسراو ☰ ١. کاغذ ٢. نامە

⊡ **کاغەزی ئا**: کاغەزی تایبەت بۆ چاپ لە ئەندازەی ٦٠٠ تا ٩٠٠ میلی‌میتردا ☰ کاغذ آ

**کاغەزی ئا ٤**: کاغەز لە ئەندازەی ٢١٠ لە ٢٩٧ میلی‌میتردا ☰ کاغذ آ-۴

**کاغەزی بێ**: کاغەزی تایبەت بۆ چاپ بە ماشین چاپی گەورە لە ئەندازەی ٧٠٠ لە ١٠٠٠ میلی‌میتردا ☰ کاغذ ب

**کاغەزی سماتە**: کاغەزپەرداخت؛ قاقەزپەرداخ؛ کاغەزساو؛ کاغەزێک کە لایەکی بە وردەکانزا یان ماکێکی زبر داپۆشراوە، بۆ ساوین و لووس کردنی ڕووبەری شتێک ☰ کاغذ سُنبادە

**کاغەزی کاربۆن**: کاغەزی ڕوویەک بە مۆمی ڕەنگی داپۆشراو کە لە نێوان دوو یان چەند پەڕەی کاغەزی دەنێن، هەر چی لە سەر پەڕەی یەکەم بنووسرێ، دەچێتە سەر پەڕەکانی ژێر ☰ کاغذ کاربُن

**کاغەزی کالک**: کاغەزێکی هێندێک ئەستوور و نیوە مات بۆ ڕەسم و نەخشە لە سەر کێشان ☰ کاغذ کالک

**کاغەزی کایی**: کاغەزی لە گژ و گیا و کاغەزە بێکارە دروستکراو بۆ چاپی ڕۆژنامە و کتێبی هەرزان‌بایی ☰ کاغذ کاهی

**کاغەزی گلاسە**: کاغەزی هەرەباشی بریقەدار بۆ چاپی ڕەنگی ☰ کاغذ گلاسە

⊡ **کاغەز ڕەش کردنەوە**: */کینایە/* ١. نووسین؛ نڤیسین؛ نویسان ٢. شتێ بنشڕ و بێ مانا نووسین ☰ ١. نوشتن ٢. چرند نوشتن

**کاغەز ناردن**: کاغەز نووسین؛ نامە ناردن ☰ نامە فرستادن

**کاغەز نووسین**: ☜ **کاغەز ناردن**

**هێنانە سەر کاغەز**: نووسین ☰ نوشتن

**کاغەزبازی** / kaxezbazî/: ناو. */کینایە/* چۆنیەتی درێژکردنەوەی ڕەوتی کاروباری ئیداری ‹ئەبێ ئەم کاغەزبازییە کەم ببێتەوە تا خەڵک بە کار و باریان ڕابگەن› ☰ کاغذبازی

**کاغەزپەرداخت** / kağezperdaxt/: ☜ **کاغەزی سماتە**

**کاغەزدان** / kaxezdan/: ناو. شتێ کە قاقەزی تێ بخەن ☰ کاغذدان؛ پوشە

**کاغەزساو** / kaxezsaw/: ناو. قاقەز سماتە ☰ کاغذ سُمبادە

**کاغەزی** / kaxezî/: ناوەڵناو. */مەجاز/* تەنک و ناسک ☰ نازُک

**کاف** / kaf/: ناو. ١. کێ؛ ناوی عەرەبی بیست‌ودووەمین پیتی ئەلفوبێی زمانی کوردی ٢. ئەشکەوت؛ ئەشکەفت؛ مغارە ☰ ١. کاف؛ نام بیست‌ودومین حرف الفبای زبان کُردی ٢. غار

**کافا** / kafa/: ناو. ١. کات؛ کاتات؛ قەحف؛ کەللەی سەر ٢. پشتەمل؛ پشت مل ☰ ١. جُمجُمە ٢. پس‌گردن

**کافر**[1] / kafir/: ناو. ١. خوانەناس؛ بێ‌دین؛ کەسێ کە دینێکی ڕاستەقینەی نییە ٢. */مەجاز/* کەسێ کە موسوڵمان نییە ٣. کەسێ کە ڕاستەقینەیەک دەزانێ بەڵام پشتی لێ دەکا ☰ ١تا٣. کافر

**کـافر**[۲]: ئاوەڵـناو. ۱. خوانـەناس؛ دیــندوژمــن؛ حاشاکەر؛ بێئۆل؛ بـێدیـن؛ بـێئـایین؛ دینسـز؛ دیندڕ؛ زندق؛ بێبـڕوا بـە خـوا ۲. *[مەجاز]* سپڵـە؛ پێنەزان ☰ ۱. کافر ۲. ناسپاس

⊡ **کـافر بـوون**: ۱. لـە دیـن وەرگـەڕان ۲. *[کینایە]* تووڕە بوونی زۆر ☰ ۱. از دین برگشتن ۲. بسیار خشمگین شدن

**کافرسان** / kafirsan/: ☜ **کافرستان**

**کافرسانی** / kafirsanî/: ☜ **کافرستان**

**کافرســتان** / kaf(i)ristan/: نـــاو. کافرســـــان؛ کافرسانی: ۱. شوێنی کـافران و خوانەناسـان ۲. *[مەجاز]* جێگەی شلووغ و قەرەباڵغ ☰ ۱. کُفرستان ۲. جای شلوغ

**کافرستانی** / kaf(i)ristanî/: نـاو. *[کینایە]* شـوێنی بێڕوحمی و بەزە بە هەژاراندا نەهاتنەوە ‹شەرتەن بکێشۆ دڵ جەفات، با یادگار مانۆ جە لات/ تۆ بۆت نـە دڵ خۆفی خودات، خۆ کافرستانی نێۆ «سەیدی»› ☰ مکان شقاوت و بی‌اعتنایی به بینوایان

**کافرمان** / kafirman/: ناو. گوزان؛ گوێزان؛ چەقۆی تیژی مووتاش ☰ استره؛ تیغ موتراشی

**کافک** / kafik/: نـاو. ئەشـکەوت؛ مغـارە؛ کـاف؛ شکەفت ☰ غار

**کافور** / kafûr/: ناو. کاپوور: ۱. داری کافوور؛ ناوی دوو جۆر دارە کە ناوقەدیان دەقەڵشێنن و مـاکی کافووری لێ دەگرن ۲. ماکێکی سپی بە بـۆنێکی تایبەتەوە کە زوو گڕ دەگرێ و هێندێک ژەهرییە و لە بژیشکی و پیشەسازیدا زۆر کەڵکی هەیـە ☰ ۱و۲. کافور

**کافووری** / kafûrî/: ئاوەڵـناو. ۱. بـە ڕەنگـی سـپی بـێخـەوش ۲. دروسـتکراو لـە کـافوور ☰ ۱و۲. کافوری

**کافـە** / kafe/: نـاو. ۱. چێشـتخانە؛ خواردنگـە؛ خوارنگـــەھ ۲. قاوەخانــــە؛ چاخانـــــە ۳. شـیرینیخانـەیێ کـە شـوێنی دانیشـتنی بـۆ خواردنی شیرینی هەیە ☰ ۱. رستوران ۲. کافەتریا ۳. کافە قنادی

**کافەگلاسـە** / kafeg(i)lase/: نــاو. چەشـــــنێ خواردنەوە، تێکەڵی شـیر و بەسـتەنی و قـاوە ☰ کافەگلاسه

**کافی** / kafî/: ئاوەڵـناو. بەس؛ زیادە؛ بـە ئەنـدازە ☰ بس

**کافیشاپ** / kafîşap/: ناو. دووکانێ کە تێیدا قـاوە، چای و خواردنەوەی گەرم بە مشتەری دەدرێـت ☰ کافی‌شاپ

**کافینێت** / kafînêt/: ناو. دووکانێ کە هەڵی تـۆڕی ئینتـەرنێتی بـۆ مشـتەرییەکانی ڕەخسـاندبێ ☰ کافی‌نت

**کـاڤ** / kav/: نـاو. جەنگـەی فنـق چـنین کـە لـە سێهەمی ڕەزبەرەوەیە ☰ **موسم چیدن فندُق**

**کاڤار** / kavar/: ناو. ئاقار؛ ناوچە؛ مەڵبەند ☰ ناحیه؛ اقلیم

**کاڤان** / kavan/: ☜ **کابان**

**کاڤر** / kavir/: ☜ **کاوڕ**

**کاڤری** / kavrî/: ناو. ۱. جـۆرێ هـەنار ۲. بـەرخی مێ ☰ ۱. نوعی انار ۲. برّه‌ی ماده

**کاڤڕ** / kaviř/: ناو. کاوڕ: ۱. بەرخی لە دایک دابڕاو کە چیتر شیر ناخوا و دەکەوێتە پـووش‌وپـەلاش خواردن ۲. بەرخەساوا ☰ ۱. **برّه‌ی از شیر بُریـده ۲.** برّه‌ی نوزاد

**کاڤشکی** / kavişkî/: نـاو. پـێش‌بـینی؛ بـەربووری؛ دوابــینی؛ کــار و ڕەوتی خەبــەر لــە دواڕۆژ یــان ئاکامی کار دان ☰ **پیش‌بینی**

**کاڤل** / kavil/: ☜ **کاول**

**کاڤلاش** / kavlaş/: ☜ **کاولاش**

**کاڤلان** / kavlan/: ☜ **کالان-۱**

**کاڤۆک** / kavok/: ☜ **کۆتر**[۱]

**کاڤی** / kavî/: ☞ **کێوی**

**کاڤیرک** / kavîrik/: ☞ **کارگ-١**

**کاڤیلک** / kavîlik/: ☞ **کارگ-١**

**کاک** / kak/: ناو. ١. کاکە؛ برای گەورە ٢. کاکە؛ وشەی حورمەت بۆ پیاوان ٣. جۆرێ شیرینی تایبەتی شاری کرماشان ٤. سەهۆڵ؛ سۆڵ ⚑ ١. برادر بزرگتر ٢. کلمەی احترام برای مردان ٣. کاک؛ نوعی شیرینی ۴. یخ

⊡ **کاک بوون**: بەستن لە سەرمان؛ بوونە سەهۆڵ ⚑ یخ زدن

**کاکا** / kaka/: ناو. ١. مام؛ مامۆ؛ ئاپ؛ ئاپۆ ٢. کاکە؛ وشەی بانگ کردنی برا گەورە ⚑ ١. عمو ٢. داداش

**کاکائو** / kaka'û/: ناو. کاکاهوو: ١. دارێکی کورتەبالای گەڵاپانی گوڵ مەیلەوسووری بێبۆنە، میوەیەکی خڕی زەرد یان سوور دەگرێت ٢. تۆمی ئەو دارە کە قاوەیی مەیلەوسوورە، دوو-سێ سانتیمیتر درێژە و بۆ دروست کردنی چەن جۆرە شیرینی و شوکولات بە کار دەچێ ⚑ ١و٢. کاکائو

**کاکاهو** / kakahû/: ☞ **کاکائو**

**کاکتووس** / kaktûs/: ناو. زمانەخەسوو؛ زوانەخەسوو؛ تاقمێک گیای خۆڕسکی ناوچەیی ئەمریکا، بە ساقەتە و گەڵای ئەستوور و دڕکاوی ئاودارەوە کە زۆرتریان گوڵی درشت و جوان و میوەی وەک هەنجیریان هەیە ⚑ کاکتوس

**کاکشان** / kak(i)şan/: ☞ **کاکەشان**

**کاکشیر** / kakşîr/: ناو. لەنجە و لار؛ خەمزە و ناز ⚑ ناز و خرام؛ عشوه

**کاکڤیرک** / kakvîrik/: ناو. کوارک؛ قارچک ⚑ قارچ

**کاکل** / kakil/: ناو. گیایەکی بۆنخۆش وەک ڕێحانە بە گەڵای باریکترەوە ‹کاکلت دەوێ؟ تۆکل بشکێنە!› ⚑ ریحان کوهی

**کاکڵ** / kakił/: ناو. ١. ناوکەی بادام و گوێز و... ٢. ناوەڕۆک؛ پوختە ‹کاکڵی قسەکانی چ بوو؟› ⚑ ١. مغز بادام و گردو و... ٢. لُبّ

**کاکڵە** / kakłe/: ناو. کاکڵ؛ کاکیل؛ ناوەڕۆکی بادام و گوێز و هەر دەنکێک ⚑ مغز گردو، بادام و...

**کاکڵەشێران** / kakłeşêran/: ناو. چاوشارەکێ؛ چاوشارکێ؛ قەرا-قەرا؛ قەرە-قەرە ⚑ قایم‌موشک

**کاکڵەقوچە** / kakłeqûçe/: ناو. قەڵاقووچکە؛ کاکڵی گوێز کە بە خڕی دەرچێ ⚑ مغز درستەی گردو

**کاکڵەگوێز** / kakłeg(i)wêz/: ناو. پاخلێر ⚑ مغز گردو

**کاکڵەمووشان** / kakłemûşan/: ناو. کاکڵەمێشان؛ کەلکەلەمێشە: ١. جاڵجاڵووکە؛ جۆڵاتەنە ٢. داوی جاڵجاڵووکە ٣. بازییەکی زارۆکانە ⚑ ١. عنکبوت؛ تارتنک ٢. تار عنکبوت ٣. نوعی بازی کودکان

**کاکڵەمێشان** / kakłemêşan/: ☞ **کاکڵەمووشان**

**کاکڵی** / kakłî/: ناو. گوێز؛ وەزی؛ گردەکان ⚑ گردو

**کاکنج** / kakinc/: ناو. کاکنەج؛ کێکنجی؛ بزگیلە؛ گەزۆکە؛ تەماتەجنانێ؛ گوڵەقەدیفە؛ ئاڵفەگیایەکی خۆڕسکە بۆ دەرمان دەشێ، میوەیەکی سووری وەک بەلالووکی هەیە ⚑ کاکنج

**کاکنەج** / kak(i)nec/: ☞ **کاکنج**

**کاکوچ** / kakuç/: ناو. چەکوچ؛ چەکوش؛ چاکوچ ⚑ چکُش

**کاکورک** / kakurk/: ناو. دارەسمە؛ دارتەقێنە؛ دارکوتکە ⚑ دارکوب

**کاکول** / kakul/: ناو. ١. کاکۆڵ؛ پۆپ؛ پۆپە ٢. جۆرێ گەنم ⚑ ١. کاکل ٢. نوعی گندم

**کاکۆ** / kako/: ناو. ١. وشەی دواندنی براگەورە ٢. وشەی حورمەت بۆ پیاوان ٣. خاڵۆ؛ برای دایک

🆚 ۱. داداش ۲. کلمەی احترام مردانه ۳. دایی

**کـاکۆت / kakot/**: نـاو. کـاکووت: ۱. ئێسـکبەند؛ ئێسکێلێت؛ سەرجەم ئێسکەکانی لەشی مرۆڤ یان گیانەوەر ۲. *[مەجاز]* کەللەسەر؛ قـەحف 🆚 ۱. اسکلت ۲. جُمجُمه

**کاکۆتەڵ / kakoteł/**: ناو. کـای پاشمـاوەی چـەت کوتان 🆚 کاه حاصل از کوبیدن کوزر

**کاکۆڵ / kakoł/**: نـاو. ۱. مووی درێـژی پێشەسـەر ۲. پۆپەی بەرزی باڵندە 🆚 ۱. کاکُل سـر ۲. کاکُـل پرنده

**کاکۆڵدار / kakołdar/**: ئاوەڵناو. پـۆپن؛ پۆپنـەکی؛ سەربەکڵاوە 🆚 کاکُلی

**کاکۆیە / kakoye/**: ناو. کـاکۆ؛ خـاڵ؛ خاڵـۆ؛ لاڵـۆ؛ لاڵە؛ برای دایک 🆚 دایی

**کاکووت / kakût/**: ☜ کاکۆت

**کاکـوچی / kakûçî/**: نـاو. کاکووچیـل؛ شـەلەمین؛ ترخێنە 🆚 آش شلغم و گندم

**کاکوچیل / kakûçîl/**: ☜ کاکوچی

**کاکە / kake/**: نـاو. کاکی؛ کاگـە؛ گاگـە: ۱. بـرای گەورە ۲. وشەی حورمەت بـۆ پیـاوان لـە بانـگ کردن و دوانـدنیان 🆚 ۱. بـرادر بـزرگ ۲. کلمـەی احترام برای مردان

**کاکەبرا / kakeb(i)ra/**: ☜ کاکەلێ

**کاکەبەشانە / kakebeşane/**: ناو. زیابەشانە؛ کـاری خاترگرتنی کەسێک لە چاو باقی 🆚 اضافه سهم

**کاکەشان / kakeşan/**: ناو. کادز؛ کاکشان؛ کاکێش؛ کاکێشان؛ کۆمـک؛ کۆمکاسـێویان؛ کەشکەشـان؛ کەشکەلان؛ سەرجەمی بـێ‌ئـەژماری ئەسـتێرە و مانگ و خۆر لە ئاسمان کە پێکەوە خولگەیەکیان هەیە 🆚 کهکشان

**کاکـەلێ / kakelê/**: سارستە. کاکـەبرا؛ کـاکی‌بـرا؛ کاکیلە؛ وشەی خۆشەویستی لە دواندنی پیـاو 🆚 داداشی

**کاکەیی / kakeyî/**: ناو. گـۆران؛ چەنـد تیرەیـەکی کوردن کە ئاینێکی تایبەتیان هەیە 🆚 اهل‌حق

**کاکی / kakî/**: ناو. ۱. ☜ **کاکە** ۲. دەشتی ڕاستی تەخت 🆚 ۱. ☜ **کاکە** ۲. جُلگەی هموار

**کاکی‌برا / kakîb(i)ra/**: ☜ **کاکەلێ**

**کاکی‌بـەکاکی / kakîbekakî/**: ئاوەڵـناو. *[کینایـە]* بەربلاو؛ پان و بەرین ‹دەشـتی کـاکی‌بـەکاکی› 🆚 وسیع

**کاکیل / kakîl/**: ☜ **کاکڵە**

**کاکیلکە / kakîlke/**: ☜ **کاکیلە**[1]

**کاکیلـە[1] / kakîle/**: نـاو. کاکیلکـە؛ شـەویلاکە؛ شەویلکە؛ شەویلە؛ کاڕێژ؛ هەرکام لە چوار ددانـێ (ئەگەر ددانی عەقڵیش دەرهاتبێ پێنج) کە لە هـەر دوو لای شەویلکەی سەروخوارەوە دەردێن و بـۆ هاڕین و ساوینی پاروو بە کار دێن 🆚 آرواره

**کاکیلە[2]**: ☜ **کاکەلێ**

**کاکێژ / kakêj/**: ناو. کەو؛ کارماخ؛ بێژنگ 🆚 غربال

**کاکێش / kakêş/**: نـاو. ۱. کەسێ کا بە بار دەباتەوە ئاوایی ۲. ☜ **کاکـەشـان** 🆚 ۱. کـاهکش ۲. ☜ **کاکەشان**

**کاکێشان / kakêşan/**: ☜ **کاکەشان**

**کاگارس / kagar(i)s/**: ناو. ۱. کای گەنمەشامی ۲. قوڕ و کا بۆ سواخ 🆚 ۱. علف ذرت ۲. کاهگل

**کاگرس / kagirs/**: ناو. کای درشت 🆚 کاه درشت

**کاگڵ / kagił/**: ناو. ۱. کای ورد کە بـۆ قوڕەکـاری دەشێ ۲. قـوڕ وکـا بـۆ سـواغ 🆚 ۱. کـاەریـزە ۲. کاهگل

**کاگە / kage/**: ☜ **کاکە**

**کاگەز / kagez/**: ☜ **کاغەز**

**کاڵ[1] / kal/**: ناو. ۱. کاڵێ؛ باپیر؛ باوا ‹لە هەمبەر زوڵم و زۆرێ/ باب و کاڵێ مە ڕابوون «جگـەر خـوێن»› ۲. پیرەمێرد؛ پیاوی پیر 🆚 ۱. نیا ۲. پیرمرد

**کاڵ[2]**: ئاوەڵـناو. ۱. کوڵ؛ نەبڕ ۲. نەگەیشـتوو؛ کـاڵ

۳. کەت؛ لێوارپەڕیو ٤. کەل؛ بێددان؛ ددان لە دەمدا نەماو ٥. *[کینایە]* تەمەن لە نێوان چل تا پەنجا ☰ ۱. کُند ۲. نارسیده؛ کال ۳. لبپر شده ۴. بی‌دندان ۵. میانسال

⊡ **کال بوون** ۱. کەت بوون؛ کەل بوون ۲. سەردەمی لاوەتی تێپەڕ کردن ☰ ۱. لبپر شدن ۲. دوران جوانی را پشت سر گذاشتن

**کالاکسی** / kalaksî/: ناو. گوانەڕەقە؛ نەخۆشییەکی گوانی پاتاڵە ☰ بیماری کالاکسی (احشام)

**کالان**[1] / kalan/: چاوگ. کێلان؛ نیان ☰ کاشتن

**کالان**[2]: ناو. کالەنی؛ کێنات: ۱. کاڤلان؛ کالوان؛ کاولان؛ کایلان؛ کێلان؛ زلخاو؛ قلاف؛ قاب؛ قاپ؛ قافک؛ بەرگی شیر و خەنجەر و... ۲. کانزای برنج ۳. گیای بەزیان کە ئەبێ بژار بکرێ ☰ ۱. نیام ۲. آلیاژ برنج ۳. گیاه هرز

**کالاندن** / kalandin/: چاوگ. بالاندن؛ بارە کردنی مەڕ ‹پەز دکالێنێ گا دەبۆڕێنێ› ☰ بع‌بع کردن

**کالانە** / kalane/: ناو. کالانە؛ کێلانە: ۱. جێ چاو؛ قولکی چەم ‹کە گلێنەم ئەفرێ بۆ لای/ وەک سەرنجم هەڵبخلیسکێ/ چاو ئەترووکێ و کزەبایەک/ کالانە پڕ ئەکا لە ئاو «شێرکۆ»› ۲. تەنگایی نێوان هەر دوو سمت ☰ ۱. حدقەی چشم ۲. گودی میان هردو باسن

**کالانی** / kalanî/: ناو. تیژک؛ تووژک؛ چەقۆیەک کە کالانی هەبێ ☰ دشنه

**کالباس** / kalbas/: ناو. باسترمە؛ باسترمە؛ تێکەڵێک لە گۆشت و چەوری و بەهارات و... کە دوای چەرخ کردن، دە کیسەیەکی ناسک ئاخنراوە و کوڵاوە ☰ کالباس

**کال‌حەیران** / kalĥeyran/: ناو. شیوی ساوار و دۆ ☰ آش بلغور و دوغ

**کالک**[1] / kalik/: ناو. ۱. باپیر؛ باوا؛ باوەگەورە ۲. شەکال؛ کاڵە؛ پێتاوی لە چەرمی خاو ☰ ۱. نیا؛ پدربزرگ ۲. چارُق

**کالک**[2]: ئاوەڵناو. کاڵ؛ نەگەیشتوو ☰ نارس

**کالکی** / kal(i)kî/: ناو. کەلەپۆر لە باپیرانەوە ☰ میراث نیاکان

**کالمە** / kalme/: ناو. جۆرێ شیری شەڕ ☰ نوعی شمشیر

**کالنی** / kalnî/: ناو. پیری؛ زێدە ژیان؛ چۆنیەتی زورهان بوون ☰ پیری و فرتوتی

**کالوان** / kalwan/: ☜ **کالان**[2] **ـ۱**

**کالوخ** / kalux/: ناو. کالوخک؛ بەرگی قورعان ☰ پوشش قرآن

**کالوخک** / kaluxk/: ☜ **کالوخ**

**کالوری** / kalurî/: ناو. ۱. *[فیزیک]* یەکەی پێوانی گەرما بەرانبەر بە رادەیەک لە گەرما کە گرەمێک ئاو، یەک پلەکی سانتیگراد گەرمتر بکاتەوە ۲. *[ژینناسی]* تین و هێزێ کە لە خواردنی خۆراکەوە دێتە ناو لەش ۳. ئەو رادە لە هەر خواردەمەنییەک کە یەک کالوری تین، گەرما یان هێز بەدی بێنێ ☰ ۱تا۳. کالُری

**کالۆ** / kalo/: ناو. ۱. باب؛ باوک ۲. وشەی دواندنی پیری بەڕێز ۳. نازناوی پێشەوا یان سەرکۆمار ☰ ۱. پدر ۲. کلمه‌ی احترام به پیر ۳. لقب رهبر یا رئیس‌جمهور

**کالوش** / kalûş/: ☜ **کلاش ـ۲**

**کالوم** / kalûm/: ئاوەڵناو. تەمەڵ؛ تەپ؛ تەوەزەل ☰ تنبل

**کالومە** / kalûme/: ناو. کەچەشیر؛ شمشێری خراپ و بێ‌قیمەت ☰ شمشیر نامرغوب

**کاله**[1] / kale/: ناو. ۱. ئەسپی رەش ۲. کلاش ۳. کالە؛ شەکال؛ پێتاوی لە چەرمی خاو ☰ ۱. اسب سیاه ۲. کلاش؛ نوعی کفش نخی دست‌دوز ۳. چارُق

**کاله**[2]: ئاوەڵناو. کاڵ؛ ناقسال؛ نە پیر نە جوان ☰ میانسال

**کالەدەند / kaledend/**: ناو. کەرستەی خاوی دەکارنەکراو ☰ مادەی اوّلیە

**کالەر / kaler/**: ناو. کالا؛ ماڵی بازرگانی ☰ کالا

**کالەک / kalek/**: ناو. هاوعاشیرەت؛ هاوتیرە ☰ هم تیره؛ از یک طایفه

**کالەکاڵ / kalekal/**: ناو. قالەقاڵ ☰ جنجال و هیاهو

**کالەکە / kaleke/**: ☜ کێلەکە

**کالەگ / kaleg/**: ناو. ۱. دریشووکەی مار ۲. چزوو (دووپشک و...) ☰ ۱. زبان مار ۲. نیش

**کالەمێر / kalemêr/**: ناو. پیرەمەرد؛ پیرەپیاو ☰ پیرمرد

**کالەنی / kalenî/**: ☜ کالان

**کالەی**[1] **/ kaley/**: ناو. ۱. پیری؛ زورهانی ۲. کاڵی؛ نەگەیشتووی ☰ ۱. پیری ۲. خامی

**کالەی**[2]: ئاوەڵناو. بێددان ☰ بی‌دندان

**کاڵهەیران / kalheyran/**: ناو. گەبۆل ☰ نوعی آش

**کالی / kalî/**: ناو. زورهانی؛ تەمەن‌زۆری ☰ پیری و کهنسالی

**کالیار / kalyar/**: ناو. ترۆزی زل و ترش کە بۆ تۆم هەڵگیراوە ☰ خیار چنبر پیر کە برای بذر نگهداری می‌شود

**کالیتگا / kalîtga/**: ناو. کالەت؛ ڕەبەت ☰ کمین شکارچی

**کالیتی / kalîtî/**: ناو. پیری؛ پیریەتی ☰ پیری

**کالیسکە / kalîske/**: ناو. گالیسکە؛ فایتوون؛ پێتوون؛ پەیتوون؛ عارەبانەی سەر داپۆشراوی چوارچەرخ کە یەک یان چەند ئەسپ دەیکێشن و مسافری پێ دەگوێزرێتەوە ☰ درشکه؛ کالسکه

**کالیفورنیوم / kalîfurn(i)yum/**: ناو. توخمی کیمیاوی کانزایی ڕادیۆئەکتیڤ لە دەستەی ئاکتینیدەکان بە ژمارەی ئەتومی ۹۸ و ڕەنگی خۆڵەمێشی کە لە بوردوومانی کوریوم بەرهەم دێ ☰ کالیفُرنیُم

**کالیماست / kalîmast/**: ناو. خەرمان‌لۆغە ☰ سور آماده شدن خرمن

**کالیمستی / kalîmistî/**: ☜ کاڵەمستێن

**کالین / kalîn/**: چاوگ. ۱. گریانی بە دەنگی بەرز؛ زۆر ـ زۆر گریان ۲. بالاندنی بەرخان ☰ ۱. زار ـ زار گریستن ۲. بع ـ بع کردن بره

**کالیوم / kalyum/**: ☜ پوتاسیم

**کالێنی / kalênî/**: ناو. زورهانی؛ زۆر بە عومری ☰ پیری؛ کهنسالی

**کاڵ**[1] **/ kał/**: ناو. ۱. کال؛ باپیر؛ باوا ‹باب و کالت بە نەزانی مردن/ بیری سەربەرزییە وای لێ کردن «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ۲. پیرەمێرد؛ پیاوی پیر و زورهان ۳. ڕەنگی ئاچخ ٤. قاوەیی ئاچخ ☰ ۱. نیا ۲. پیرمرد ۳. رنگ روشن ۴. رنگ قهوه‌ای روشن

**کاڵ**[2]: ئاوەڵناو. ۱. نەگەیشتوو ‹ئەم سێوە جارێ کاڵە، ناخورێ› ۲. ڕەنگ‌نەماو ‹ڕەنگەکەی کاڵ بۆتەوە› ۳. نەکولاو ‹چێشتەکە کاڵە با جارێ بکولێ› ٤. کەمڕەنگ ‹قاوەیی کاڵ› ٥. بە ڕەنگی ڕەشی ئاویکار ٦. ئابی ئاماڵ‌زەرد (چاو) ۷. ڕەشی ئاماڵ ئابی (چاو) ۸. زۆر ڕەشی چەرمێنە زۆر چەرمگ (چاو) ۹. سێ بەهار دیتوو (شەک) ‹بەنی دەسرازەت خوری شەکی کاڵ/ دابەستەی کوێستان، چراگای سەریاڵ «قانع»› ۱۰. بێ‌ئەزموون؛ بێ‌تەجرەبە ‹خۆ ڕانەگری لە کاتی تاڵی/ مەرگت بوێ، پوختە نیت و کاڵی «هەژار، *مەموزین*»› ۱۱. گوێ بازگ (بزن) ۱۲. چاندراو؛ کێڵیاگ ☰ ۱. کال؛ نارس ۲. رنگ‌باخته ۳. خام؛ ناپخته ۴. کم‌رنگ ۵. سیاه با سایەی آبی ۶. زاغ؛ آبی مایل به زرد (چشم) ۷. سیاه مایل به آبی (چشم) ۸. سیاهِ با سفیدی خیلی سفید (چشم) ۹. سه بهار دیده (گوسفند) ۱۰. بی‌تجربه ۱۱. گوش خلنگ (بُز) ۱۲. کاشته شده

▣ **کاڵ بوون**: ۱. نەگەیشتن؛ نەگەیبو بوون ‹تەماتەکە هێشتا کاڵە› ۲. نەکولاو بوون ☰ ۱.

نارس بودن ۲. پخته نشدن

**کاڵ بوونەوە:** کاڵەوە بوون: ۱. ڕەنگ چوون ‹ئەم قوماشە کاڵ دەبێتەوە› ۲. [کینایە] لەڕوو چوون؛ شەرمەزار بوون ‹کە دەرکەوت درۆی کردووە، کاڵ بۆوە›. هەروەها: **کاڵ کردنەوە** ☰ ۱. رنگ باختن ۲. شرمنده شدن

**کاڵەوە بوون:** ☜ **کاڵ بوونەوە**

**کاڵ**[٣]: ئامراز. تشت؛ هەرامە؛ هین؛ شتەکەی ناوی نایەتە سەر زمانم ‹مەلاوکاڵ؛ سۆفیوکاڵ› ☰ چیز

**کاڵ ـ**[٤]: پێشوشە. بە نەگەیشتوویی؛ بە کاڵی ‹کاڵکەن› ☰ کال ـ

**ـ کاڵ**[٥]: پاشەوشە. کاڵین ‹تەڕەکاڵ› ☰ ـ کاشت

**کاڵ**[٦]: پێرۆ. ← **کوڵکەوکاڵ/ کشتوکاڵ**

**کاڵا / kała/:** ناو. ۱. پیتەوا؛ ماڵ؛ ئەوەی بۆ کڕین و فرۆشتن بشێ ۲. قوماش؛ ماڵی گەزی ☰ ۱. کالا ۲. قُماش؛ پارچە

**کاڵات / kałat/:** ناو. ۱. تاڵان؛ پوویر؛ پوور؛ چەپاو ۲. قوماشی تۆپ ☰ ۱. غارت ۲. پارچەی توپ

**کاڵاقنگ / kałaqing/:** ☜ **قاڵەقنگ**

**کاڵاکوت / kałakut/:** ناو. تیلای گەلا و جل کوتان ☰ کدینە

**کاڵان**[١] **/ kałan/:** چاوگ. قسەی چاونەزێرانە گوتن؛ بە ئێرەیی باس کردن ☰ حرف حسودانە زدن

**کاڵان**[٢]**:** ☜ **کالان**[٢]**ـ١**

**کاڵانە / kałane/:** ☜ **کالانە**

**کاڵای / kałay/:** چاوگ. کاڵتەی؛ کاڵین: ۱. شێف برین ۲. وەشاندن؛ پژاندن ‹مـن وێم مـەزانوو کـام تۆمم کاڵان/ یـاران پـەی هیممـەت ومنـەم مـەلالان «مەولەوی»› ☰ ۱. شخم زدن ۲. افشـاندن؛ پاشـیدن (بذر)

**کاڵتەی / kałtey/:** ☜ **کاڵای**

**کاڵفام / kałfam/:** ناوەڵناو. گەوج؛ عەقڵسووک ☰ کم‌عقل

**کاڵک / kał(i)k/:** ناو. کاڵە؛ پێتاوی لە چەرمی خاو ☰ چارُق

**کاڵکەن**[١] **/ kałken/:** ناو. [کینایە] دۆخی منداڵ لەبەرچوون ‹کاڵکەن لە زایین دژوارترە!› ☰ وضعیت سقط کردن

**کاڵکەن**[٢]**:** ناوەڵناو. ۱. بە کاڵی ڕنیاگ (میوە) ۲. نەگەیشتووی بە چەقۆ هەڵدڕاو (کوان) ☰ ۱. کال کندە شدە (میوە) ۲. نارسیدە تیغ خوردە (دُمل)

**کاڵگەمارانە / kałgemarane/:** ☜ **کاڵەکەمارانە**

**کاڵمەکاڵ / kałmekał/:** ناو. کاڵومەکاڵ؛ زەمینێ کە بڕێکی داچێندراوە و بڕێکی بەیار ماوە ☰ زمینی کە قسمتی از آن زیر کشت و قسمتی بایر است

**کاڵوکرچ / kał û kirç/:** ناوەڵناو. ۱. لە گەیشتن زۆر دوور ۲. [کینایە] ڕووتاڵ و سپی و ناسک (مرۆڤ) ☰ ۱. بسیار کال و نرسیدە ۲. بلوند

**کاڵومەکاڵ / kał û mekał/:** ☜ **کاڵمەکاڵ**

**کاڵۆک / kałok/:** ☜ **کاڵە**[١]**ـ ٢**

**کاڵە**[١] **/ kałe/:** ناو. ۱. ☜ **کاڵک** ۲. کاڵۆک؛ کەوشی چەرمی دەسکرد، بۆ ڕاو ‹کاڵەم دڕا و چەم پێ نەبڕا «مەسەل»› ☰ ۱. ☜ **کاڵک** ۲. کفش چرمی دست‌دوز، ویژەی شکار

▣ **کاڵەی شەمامبەندی:** جۆرێک پێڵاوی چەرم، بە هەورێشمی ڕەنگاوڕەنگ گوڵینگیان پێوە هەڵدەواسی ☰ نوعی کفش دست‌دوز قدیمی

**کاڵە**[٢]**:** دەنگەناو. کاڕەی مەڕ و بەرخ ☰ بع؛ صدای بلند میش و برّه

**کاڵە ـ**[٣]**:** پێشوشە. بەر لە کاتی خۆ؛ نەگەیشتوو (بۆ کات) ‹کاڵەشێو؛ کاڵەکوت› ☰ پیش وقت

**کاڵەبڕوێش / kałebiřwêş/:** ناو. ۱. ساوار لە گەنمی نەکوڵاو ۲. [کینایە] تەرزەی ورد ☰ ۱. بلغور گندم ناپُختە ۲. تگرگ ریز

**کاڵەبێن / kałebên/:** ناو. پێوانەیەکە بۆ بەفری باریو بە قەد کاڵەیەک ‹لە دوێنێوە دوو کاڵەبێن

بەفر باریوە!› مقیاسی برای ارتفاع برفِ بر زمین نشسته

**کاڵەپێ / kałepê/**: ناو. ئەوەندە بەفر کە پێڵاو داپۆشێ ‹کاڵەپێیەک باریوە!› مقدار برفی که روی کفش را بپوشد

**کاڵەپێچ / kałepêç/**: ناو. پەڕۆ و پاڵی ناو کاڵە پارچه‌ای که زیر چارُق بر پای می‌پیچند

**کاڵەت / kałet/**: ناو. تالان؛ کالات؛ پووڕ؛ چەپاو غارت؛ تاراج

**کاڵەدڕانە / kałed(i)řane/**: ناو. حەقی بە ڕێدا ڕۆیشتن بۆ کاری کەسێ پایمُزد؛ حق‌ُالقدم

**کاڵەشێف / kałeşêf/**: ناو. شێوەردی پێش باران بارین شُخم باران نزده

**کاڵەک / kałek/**: ناو. ١. قەرپوز؛ گندۆرە ‹کاڵەک شیرین ماڵ چەقەڵە «مەسەل»› ٢. خرچە؛ قەرەخرچە ٣. کاڵەی چەرم ٤. کڵاش ١. خربُزه ٢. خربُزه‌ی نارس ٣. چارُق چرمی ۴. نوعی گیوه

**کاڵەکوت / kałekut/**: ئاوەڵناو. کوتراو بۆ شەربەت (مێوژ) کوبیده برای شربت (کشمش)

**کاڵەکەمارانە / kałekemarane/**: ناو. کالگەمارانە: ١. شفتیتالک؛ شفتیتاله؛ شمتیتالک؛ شوومی شەیتوونی؛ گیایەکە بەرێکی خڕەکەی لە بیچمی شەمامەی زۆر پچووک دەگرێ بۆنێکی زۆر ناخۆشی هەیە و زۆر تاڵە بۆ دەرمان دەشێ ٢. ڕێزەڵە ١. هندوانه‌ی ابوجهل ٢. تاجریزی

**کاڵەمستانە / kałemistane/**: ☞ کاڵەمستێن

**کاڵەمستێ / kałemistê/**: ☞ کاڵەمستێن

**کاڵەمستێن / kałemistên/**: ناو. کاڵەمستێنە؛ کالیمستێ؛ کاڵەمستانە؛ کاڵەمستێ؛ کاڵەمشتێ؛ پشکیلان ‹... وامان دەپشکنن دەڵێی پشکی کاڵەمستێن تاقەت دەکەن! «هەژار، چێشتی مجێور»› بازی گُل یا پوچ

**کاڵەمستێنە / kałemistêne/**: ☞ کاڵەمستێن

**کاڵەمشتێ / kałemiştê/**: ☞ کاڵەمستێن

**کاڵەمووین / kałemûyîn/**: ناو. ڕەشک؛ پێڵاوی لە موو یان لباد پای‌افزار موین یا نمدی

**کاڵەمێر / kałemêr/**: ناو. پیاوی زۆر پیر مرد کُهنسال

**کاڵەوپێتاو / kałe w pêtaw/**: ناو. *[مجاز]* پاڵاو زەنگاڵی سەفەر ‹کاڵەوپێتاوی هەڵپێچاوە› باروبنه سفر

**کاڵەوزەنگاڵ / kałewzengał/**: ناو. پێتاو؛ پێ‌پۆش؛ پاتاوە پاتابه

**کاڵەوەبوو / kałewebû/**: ئاوەڵناو. ڕەنگ‌لێنەماو و بەرەو سپییەتی گەڕاو رنگ‌باخته

**کاڵەهێش / kałehêş/**: ناو. شێوی یەکەم شخم اوّل

**کاڵی**[1] **/ kałî/**: ناو. ١. نەگەیشتوویی ٢. خاوی؛ خلیسکی ١. کالی ٢. خامی

• **کاڵی**[2]: پاشەوشە. کاڵین ‹تەڕەکاڵی› ـ کاری

**کاڵیان / kałyan/**: چاوگ. ١. دەنگ هەڵێنان بە تووڕەیی ٢. ئێرەیی بردن ٣. جووت لە زەوی دان ١. غُریدن ٢. رشک بردن ٣. شُخم زدن

**کاڵیای / kałyay/**: چاوگ. کێڵران؛ کێڵیان کاشته شدن

**کاڵیت / kałît/**: ناو. ١. ڕەبەت؛ بۆسە؛ سیپە ٢. کۆخ؛ قۆختە؛ کۆڵیت ١. کمین شکارچی ٢. کُلبه

**کاڵین / kałîn/**: چاوگ. //کاڵیت؛ دەکاڵێ؛ بکاڵە// ١. شێو بڕینی زەمین ٢. ئێرەیی بردن ٣. بە قەو قاو کردن ١. شخم زدن ٢. رشک بردن ٣. بانگ زدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێتی: نەکاڵین

**کام**[1] **/ kam/**: ناو. ١. ئاوات؛ ئارەزوو ٢. نەخۆشی بلۆقاوی دەمی یەکسم ٣. ئاڵی ددان؛ کولی دیان ١. آرزو ٢. نوعی بیماری دام ستور ٣. کُندی دندان

⊡ **کام ئـاژنین:** چـارە کـردنی کـامی یەکسـم بـە شـووژن ئـاژن کـردنی زاری 🇮🇷 معالجـه کـردن بیماری کام ستور با جوالدوز

**کـام شکان:** خواردنی شتێک بۆ ئیشـتا بـە سـەر چوون 🇮🇷 کام یافتن

**کـام کـردن:** ١. تووشـی نەخۆشـی کـام هـاتنی یەکسـم ٢. تـۆو پـەڕین؛ نـەوس/ تـۆم تکـان؛ ئەسـتوور بـوون لـە بـەر دیـتن و نـەخواردنی شتێک 🇮🇷 ١. به بیماری کام دچار شـدن سـتور ٢. بیماری بو گرفتن، از دیدن و شنیدن بوی خوراک

**کام گرتن:** ١. بە ئـارەزوو و ئـاوات گەیشـتن ٢. *[مـەجاز]* خۆشگوزەرانی کردن؛ ڕابواردن 🇮🇷 ١. به آرزو رسیدن ٢. خوشگذرانی کردن

**کـام**[٢]: ئاوەڵناو. کامە؛ کێهە؛ کیک؛ کیشک؛ کیـژان؛ کیژک؛ وشەیەک بۆ ناسینەوەی ئەنـدامێکی نێـو کۆمایەک ‹کێ لە موختەبـەر هینـده مایـەوە؟/ کـام مەل؟ کام ئاژەڵ؟ کام کان؟ کام گیـا؟ «پەشـێو»› 🇮🇷 کُدام

**کـام**[٣]: جێناو. کامە؛ کێهـا؛ کێهـە؛ کامـەتا؛ کامەتـە؛ کامەتانێ؛ کامەتانی؛ کیژ؛ کیژان؛ کیژک؛ کیشک؛ کانجی؛ کامدەر؛ کامدەری؛ کای؛ وشەی پرسـیار بۆ ڕوون بوونەوەی دۆخی شتێ یـان کەسـایەتی کەسێک ‹کامت خۆش ئەوێ؟› 🇮🇷 کدام

**کاما / kama/:** ناو. کامـار؛ کەمـە؛ داری جـەغزی وەک کەللە بێژنگ و دەف و... 🇮🇷 چوب دایـره‌ای مانند دف و غربال و...

**کامـاخ / kamax/:** نـاو. ١. سمـــتی یەکســـم ٢. کامـاش؛ سـاقەتەی وردی مـاش ٣. تـووتنی بـە شینی ڕناو 🇮🇷 ١. کفل ستور ٢. کاه مـاش ٣. توتـون سبز چیده شده

**کامار / kamar/:** ☜ **کاما**

**کاماش / kamaş/:** ناو. ١. ساقەتەی وردی ماش ٢. *[کینایە]* تووتنێ کە بەر لە زەرد بوون وشک کرابێ 🇮🇷 ١. کاه ماش ٢. توتون نارس خشک شده

**کاماڤ / kamav/:** نـاو. پاشـاوێ کـە دوای گـرتنی سەرچاوە، لە جۆدا دەمێنێتەوە 🇮🇷 پسابی که پـس از گرفتن سرچشمه در جوی می‌ماند

**کامباخ / kambax/:** ئاوەڵناو. کەمباخ: ١. بێ‌بەڵێن؛ پـەیمانشـکێن ٢. دەسـبڕ و درۆزن ٣. کـاول؛ وێران؛ کەلارێ ‹ولاتی کامباخ› 🇮🇷 ١. سُست‌پیمـان ٢. ناروزن ٣. ویران

⊡ **کامباخ کردن:** لە بەین بـردن؛ وێـران کـردن 🇮🇷 ویران کردن

**کامبـــاخی / kambaxî/:** نــاو. ١. غـــــەدداری؛ پـەیمانشـکێنی ٢. بەدبـەختی؛ نەگبـەتی 🇮🇷 ١. عهدشکنی ٢. بدبختی

**کامپەری / kamperî/:** ☜ **کەمپەری**

**کامپیوتر / kamp(i)yutir/:** ☜ **کەمپیوتەر**

**کامدەر / kamder/:** ☜ **کام**[٣]

**کامدەری / kamderî/:** ☜ **کام**[٣]

**کامر / kamir/:** ناو. قامیش؛ چیتک؛ چیـت؛ زەل؛ لەڤەر 🇮🇷 نی

**کامران / kamran/:** ☜ **کامەران**

**کامڕان / kamřan/:** ☜ **کامەران**

**کامڕەوا / kamřewa/:** ☜ **کامەران**

**کـامڕەوایـی / kamřewayî/:** نــاو. بـــەختیاری؛ بەختەوەری؛ خاوەن بەختی 🇮🇷 خوشبختی

**کامسـۆتی / kamsotî/:** ئاوەڵـناو. کـامسـۆژکی؛ ناهومێد؛ بێ هیوا 🇮🇷 ناکام

**کامسۆژکی / kamsojkî/:** ☜ **کامسۆتی**

**کامک / kamik/:** ☜ **کامە**

**کامڵ / kamił/:** ئاوەڵناو. ١. پێگەیشتوو (دەخڵ) ٢. تێگەیشتوو (مرۆ) ٣. نێونجی تەمـەن، لـە دەوری چل و پەنجا ساڵان ‹ئەی کورد هەتا کـەی غافلـی، خۆ تۆ لە عومرا کاملی/ بۆ هیچنەزان و باتلی، تا کـەی لە سەر ئەم حالەتە؟ «موفتی پێنجـوێنی»› ٤. تەواو؛

بێ کەموکووڕی* هەروەها: **کاملی** ☰ ١. رسیده (غله) ٢. دانا و کامل ٣. میانسال ۴. کامل؛ بی‌نقص

**کامنەدیو** / kamnedîw/: ئاوەڵناو. بێ‌مراد؛ بە ئاوات نەگەیشتوو ☰ ناکام

**کاموا** / kamwa/: ناو. بەنی چەندلۆی ڕێسراو بە ماشین، لە پەموو، خوری یان هەودای دەسکرد ☰ کاموا

**کامورەوا** / kamuřewa/: ☜ **کامەران**

**کاموس** / kamus/: ☜ **کابوس**

**کامۆخ** / kamox/: ناو. کامووخ؛ کامووک؛ دۆشاوساز؛ ترێ گووش؛ کەسێ کە هەنگور دەگووشێ ☰ کسی که آب انگور می‌گیرد

**کامۆیی** / kamoyî/: ناو. نەخۆشی دەمی یەکسم ☰ بیماری دهان ستور

**کاموخ** / kamûx/: ☜ **کامۆخ**

**کامووس** / kamûs/: ناو. مۆتەکە؛ شەوە ☰ کابوس

**کاموک** / kamûk/: ☜ **کامۆخ**

**کامە**[1] / kame/: ئاوەڵناو. کام؛ کامک؛ کێهە؛ کیک؛ کیشک ‹کامە کارت لە جێی خۆیە؟› ☰ کدام؛ کدامین

**کامە**[2]: جێناو. کام؛ کامک؛ کێها؛ کێهە؛ کامەتا؛ کامەتە؛ کامەتانێ ‹کامەت جێبەجێ کردووە؟› ☰ کدام؛ کدامین

**کامەتا** / kameta/: ☜ **کام**[3]

**کامەتانی** / kametanî/: ☜ **کام**[3]

**کامەتانێ** / kametanê/: ☜ **کام**[3]

**کامەتە** / kamete/: ☜ **کام**[3]

**کامەران** / kameran/: ئاوەڵناو. کامران؛ کامڕان؛ کامڕەوا؛ کامورەوا؛ کامیار؛ کامێران: ١. بە ئاوات گەیشتوو ٢. خۆشبەخت ☰ ١. کامران ٢. خوشبخت

**کامەرانی** / kameranî/: ناو. بەختەوەری؛ بەختیاری؛ دۆخی هەبوونی ژیانی دڵخواز و پڕخۆشی ☰ خوشبختی

**کامی** / kamî/: جێناو. کیژک؛ کامە ☰ کدامی

**کامیار** / kamyar/: ☜ **کامەران**

**کامیای** / kamyay/: چاوگ. ڕێک کەوتن؛ پێکەوە کران ☰ ساختن

**کامیلیا** / kamîlya/: ناو. ١. دارچکی هەمیشە شینی گەڵا سەوزی تۆخ و بریقەدار ٢. گوڵی درشت و جوانی ئەو دارچکە، بە ڕەنگی سپی و پەمەیی کە سەرەتای بەهار دەپشکوێ ☰ ١و٢. کاملیا

**کامین** / kamîn/: ☜ **کاین**

**کامیون** / kamyun/: ناو. کامیۆن؛ لۆری؛ بارهەڵگری زوور پێنج تون ☰ کامیون

**کامیۆن** / kamyon/: ☜ **کامیون**

**کامێرا** / kamêra/: ناو. کامێڕا؛ دووربین؛ ئامرازی وێنە کێشان/ هەڵگرتنەوە ☰ دوربین عکاسی

**کامێران** / kamêran/: ☜ **کامەران**

**کامێڕا** / kamêřa/: ☜ **کامێرا**

**کان**[1] / kan/: ناو. ١. ☜ **کانگا** ٢. داری کۆڵدراو بە قەڵەمی ئاسن ٣. پنج؛ پنچک؛ بنە گیا ٤. وشەیەکە لە جگێندا ☰ ١. ☜ **کانگا** ٢. چوب کندەکاری شدە ٣. بوته ۴. اصطلاحی در قاببازی

**کان**[2]: ☜ **کۆن**[2]

**کاناپە** / kanape/: ناو. قەنەفە: ١. کورسییەک کە ژێر و پشتی دۆشەکی هەیە ٢. ئەسکەملی نەرم کە جێ دانیشتنەکەی دۆشەکی هەیە ☰ ١و٢. کاناپە

**کاناڵ** / kanał/: ناو. ١. نۆکەن؛ نۆکەند؛ کەنداو؛ کرتاڵ؛ درگە؛ درناڵ؛ جێگای دەسکرد بۆ ڕۆشتنی ئاو ٢. کەنداو؛ ڕەهەند؛ ئاوەڕا؛ ئاوەڕۆ؛ درناڵ؛ گرناڵ؛ کەنداڵی دەسکرد لە نێوان دوو چەم یان دوو زەریادا بۆ هاتوچۆی کەشتی ٣. کەناڵ؛ شەبەکە؛ ڕایەڵە؛ ڕایەڵکە ‹کاناڵی تەلەفیزیون› ٤.

لوولەی زۆرتر چوارپاڵوو بۆ ڕاگواستنی هەوا ‹کانالی کوولیر› ٥. ڕێگە؛ ڕێچار؛ شوێنەڕای کار و بیر ‹لە کانالی قانوونییەوە شوێنی بگرە!› 🇮🇷 ١تا٥. کانال

**کاناو / kanaw/:** ناو. چەم یان سەرچاوەئاوێک ماکی کانزایی لێ دەردەخەن 🇮🇷 آب دارای مواد معدنی

**کانتۆر / kantor/:** ناو. دۆلابی جلکان 🇮🇷 کُمُد لباس

**کانتۆن / kanton/:** ناو. جۆرێک یەکەی بەڕێوە بردن یان بڕیاردانی سیاسی و کۆمەلایەتی ولاتە ‹کانتۆنەکانی ڕۆژاوای کوردستان› 🇮🇷 کانتون

**کانتینێر / kantînêr/:** ناو. ١. هۆدەی گەورە بۆ تێخستن و ڕاگواستنەوەی بار (بە کامیۆن، کەشتی یان قەتار) ٢. ترەیلیێ کە ئاوا هۆدەیەکی لە سەرە ٣. ئەو هەندە لە بار کە لە وەها هۆدەیەکدایە ‹کانتینرێک شەکری سەند› 🇮🇷 ١تا٣. کانتینر

**کانج / kanc/:** ئاوەڵناو. لاسار؛ قیچمەز؛ بەدکردار؛ بەدخوو؛ ئاکارچەوت؛ ڕەوشت ناحەز 🇮🇷 بدرفتار

**کانجا / kanca/:** ☜ کێندەڕێ

**کانجی[1] / kancî/:** ناو. لاساری؛ قیچمەزی؛ بەدکرداری 🇮🇷 بدرفتاری

**کانجی[2]:** جێناو. کام؛ کێهە؛ کێژان 🇮🇷 کُدام

**کاندۆ / kando/:** ناو. مێژک؛ گوێلپارێ کە دایکی دەمژێ 🇮🇷 پارینەی شیرخوار

**کاندۆم / kandom/:** ناو. کاپووت؛ پۆشەنێکی ناسکی پەلاستیکییە، کاتی نزیکی ژن و پیاو، بۆ پێشگری لە منداڵ بوون یان نەخۆشی، بە سەر شەرمی پیاودا دەکرێ 🇮🇷 کاندُم

**کاندوو / kandû/:** ☜ کەندوو

**کاندید / kandîd/:** ناو. کاندیدا؛ ناودێر؛ ناڤدێر؛ ناڤدایی؛ دیاریکراو بۆ کارێک 🇮🇷 نامزد

**کاندیدا / kandîda/:** ☜ کاندید

**کانزا[1] / kanza/:** ناو. ویرە؛ ماکێکی زۆرتر قورس و ڕەق کە دەتاوێتەوە، چەکوشخۆرە، وەک تەلی لێ دێ، بۆ سوان و لووس کردن دەبێ، کارەبا و گەرما لە خۆی ڕادەگوێزێ و بە لە دەست دانی یۆن، باری کارەبایی هەڵدەگرێ و ئۆکسید و هیدروکسید بەرهەم دێنێ 🇮🇷 فلز

**کانزا[2]:** ئاوەڵناو. لە کاراک پەیدا بوو 🇮🇷 معدنی

**کانزایی / kanzayî/:** ئاوەڵناو. ١. لە کانزا چێبوو ٢. لە کانزا چێکراو ٣. سەر بە کانزا؛ پێوەندیدار بە کانزاوە 🇮🇷 ١تا٣. فلزی

**کانسیر / kansîr/:** ناو. سەرەتان؛ شێرپەنجە 🇮🇷 سرطان

**کانکەن / kanken/:** ناو. کرێکاری نێو کان 🇮🇷 معدنچی

**کانگ / kang/:** ئاوەڵناو. ١. بێئاگا؛ بێهای ٢. سەرلێشێواو؛ لاڕێ؛ گومڕا 🇮🇷 ١. ناآگاه ٢. گُمراه

**کانگا / kanga/:** ناو. کانگە؛ کان: ١. کاراک؛ کارە؛ کەن؛ کەند؛ کەنگ؛ مەعدەن؛ جان؛ ناوک؛ ناوکە؛ مەڵبەن؛ مەڵبەند؛ لاژوار؛ کۆگای کانەگەلی سروشتی ٢. *(مەجاز)* سەرچاوە؛ چاوکە ‹لە چوارچرای مەهاباد/ لە کانگای بیری ئازاد «هێمن»› 🇮🇷 ١. معدن ٢. سرچشمه

**کانگۆک / kangok/:** ناو. خەلۆل؛ ئێسکی پاژنەی گوێلک 🇮🇷 شتالنگ گوساله

**کانگە / kange/:** ☜ کانگا

**کانگەر / kanger/:** ناو. سەرکردە؛ فەرماندە؛ سەرپەل؛ کۆمرڤان 🇮🇷 فرمانده

**کانگی / kangî/:** ناو. بێخەبەری؛ بێهایی؛ خافڵی 🇮🇷 بی‌خبری

**کانۆک / kanok/:** ناو. ١. کانگای پچووک ٢. ساقەتەی وشک و کوتراوی نۆک 🇮🇷 ١. معدن کوچک ٢. کاه نخود

**کانوون / kanûn/:** ناو. ١. نێوی دوو مانگ لە ڕۆژژمێری هەتاوی ولاتانی عەرەبیدا ٢. خێزانە

باڵندەیەکن لە تۆرەمەی وەردەک، دندووکیان باریک، درێژ و مشارییە، لە ئاوی قووڵدا مەڵە دەکەن، بۆ هەڵفڕین دەبێ مەودایەک بە سەر ئاودا ڕا بکەن، لە سەر زەوی هێلانە ساز دەکەن، ماسی و گیانلەبەرانی ناو ئاو ڕاو دەخۆن، چەن جۆریان هەیە: کانوونی سەر سپی، کاکۆڵدار، گەورە و مراوی سەر سپی ☰ ١. نام دو ماه از ماههای رومی ٢. مرگوس

◙ **کانوونی دووهەم**: چلەشۆر؛ مانگی یەکەمی ساڵی عەرەبی، ٣١ ڕۆژە، بەرانبەر بە ژانویە ☰ کانون ثانی

**کانوونی یەکەم**: دوازدەهەمین مانگی ساڵی عەرەبی، ٣١ ڕۆژە، بەرانبەر بە دیسامبر ☰ کانون اوّل

**کانوونی** / kanûnî/: ناو. پەڕەندەیەکی بۆری ماسیخۆرە ☰ مرغی ماهیخوار

**کانە**[1] / kane/: ناو. ١. سنعاتی دار کۆڵین ٢. ئەسکەنە؛ موغار؛ ئامرازی دار کۆڵین ٣. کانگایی؛ هەرچی سەرچاوەی کانگا بێ (وەک: بەرد، کانزا و...) ☰ ١. کندەکاری چوب ٢. مُغار ٣. کانه

**کانە**[2]**-**: پێشوشە. کانگا؛ کۆگا؛ سەرچاوکە؛ سەرچاوە ‹کانەخۆڵ؛ کانەبەرد› ☰ کان؛ معدن

**کانەخەتا** / kanexeta/: ناو. دۆخی نەڕوان و سەوز نەبوونی تۆوی بە دەست چێندراو ☰ حالت رُشد نکردن دست‌کاشته

◙ **کانەخەتا نەکردن**: ڕوان و سەوز بوونی یەکەیەکەی تەو تۆمانەی بە دەست چێندراون ☰ حالت رُشد کردن دست‌کاشته‌ها

**کانەزوانە** / kanez(i)wane/: ناو. کۆڵدراوی جێگەی شیشە پەنجەرە ☰ کندەی جای شیشەی پنجره

**کانەشکاو** / kaneş(i)kaw/: ناو. ئامرازی دار کۆڵین ☰ ابزاری در کندەکاری چوب

**کانەنیا** / kanen(i)ya/: ناو. کار و ڕەوتی شەتڵ چەقاندن. هەروەها: **کانەنیا کردن** ☰ عمل نشا زدن

**کانی**[1] / kanî/: ناو. ١. کەهنی؛ کێنی؛ چەشمە؛ سەرچاوە؛ خانی؛ چاوەی ئاو ٢. نووکە؛ ئیسە؛ ئێستا ☰ ١. چشمه ٢. اکنون

**کانی**[2]: ناوەلکار. نووکە؛ ئێستا ☰ اکنون

**کانیاو** / kan(i)yaw/: ناو. ١. کانی؛ کانی‌ئاو؛ چاوک؛ چەشمە ‹ئاوی کانیاوێ کە وێنە نوێنە/ دڵی خۆی داوەتێ دلبزوێنە «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ٢. ئاوێ کە لە کانی دێتە دەر ☰ ١. چشمه ٢. آب چشمه

**کانیژە** / kanîje/: ☜ **کانێژە**

**کانیسک** / kanîsk/: ناو. ساقەتەی وشکی نیسک ☰ ساقەی خُشک عدس

**کانی‌کۆر** / kankor/: ناو. کانی کۆرک؛ کوێرەکانی؛ کانییەک کە پاش بەهار وشک دەبێ ☰ چشمەی فصلی

**کانی‌کۆرک** / kanîkorik/: ☜ **کانی کۆر**

**کانیلان** / kanîlan/: ناو. دۆڵی پڕ لە کانی ☰ درّەی پُر از چشمه

**کانیلکە** / kanîlke/: ☜ **کانیلە**

**کانیلە** / kanîle/: ناو. کانیلکە؛ کانیلێ؛ سەرچاوەی پچووک ☰ چشمەی کوچک

**کانیلێ** / kanîlê/: ☜ **کانیلە**

**کانین** / kanîn/: ☜ **کارین**

**کانێ** / kanê/: ناوەلکار. کوانێ؛ کوا؛ کا ☰ کو

**کانێژە** / kanêje/: ناو. کانیژە؛ گوڵەگەنم؛ گوڵ‌گۆچیلە؛ گوڵێکی شینە لە گەنمەجاڕ و لە نێو دەخڵ و دانا دەڕوێ ☰ گل گندم

**کانێس**/ kanês/: ناو. قەلافەت؛ سەروسیما ☰ شکل و قیافه

**کانێس‌ئەستوور** / kanês'estûr/: ئاوەلناو. ١. ڕەزاتاڵ؛ ئێسک‌گران ٢. لووتبەرز؛ خۆبەزل‌زان ☰ ١.

گرانجان ٢. مُتکبر

**کاو[1] / kaw/**: ناو. ١. شکێر؛ تلیش ٢. شاخی بەرد؛ چیای بەردین ٣. ئاوات؛ کام ‹من کاوی خۆم لە کار دیوە/ من جەرگی زەویم دڕیو «هێمن»› ٤. چیا؛ کێف؛ کێو ٥. کاوە؛ چۆنیەتی سووتانەوەی پێست ٦. نەخۆشی کام ٧. جگ؛ قاپ ٨. هەستێک کە لە نادیارەوە بە دڵدا دێت ▤ ١. شکاف ٢. صخره؛ کوه سنگی ٣. آرزو ۴. کوه ۵. سوزش پوست ۶ بیماری دهان ستور ٧. قاب؛ شتالنگ ٨ الهام

**کاو[2]**: ئاوەڵناو. ١. نرخدار؛ هێژا ٢. بەفیز؛ لە خۆبایی ▤ ١. ارزشمند ٢. خودپسند

**کاواتر / kawatir/**: ☜ **کۆتر[1]**

**کاواک / kawak/**: ئاوەڵناو. کلۆر؛ ناوبەتاڵ ▤ پوک؛ توخالی

**کاوان / kawan/**: ناو. بستوو؛ شانەشاخ ▤ ستیغ کوه

**کاواندن / kawandin/**: چاوگ. ئازار دان؛ ئەزیەت کردن ‹مەملاوێنە و مەمکاوێنە! «مەسەل»› ▤ آزردن

**کاوانەوە / kawanewe/**: چاوگ. ١. سووتانەوەی پێست ٢. کاوێژ کردن ▤ ١. سوزش داشتن پوست ٢. نشخوار کردن

**کاوای / kaway/**: چاوگ. قەلاشتن؛ تلیشاندن ‹کارد مەینەتش ئیستیخوان کاوان/ زیای دیدە و دل مەگێرەم تاوان «مەولەوی»› ▤ شکافتن

**کاوت / kawit/**: ناو. مانگ؛ هەیڤ ▤ ماه آسمان

**کاوتر / kawtir/**: ☜ **کۆتر[1]**

**کاوجوورەت / kawcûret/**: ئاوەڵناو. ترسنۆک؛ ترسۆک؛ ترسەنۆک؛ بێجەرگ ▤ ترسو

**کاوچۆ / kawço/**: ناو. کائۆچۆ: ١. ماکێکی جیرە لە گرسانی شیلەی برێ گیای گەرمیان (وەک: هیوئا و فیلکووس) بەرهەم دێ، پەڕە ـ پەڕەی دەکەنەوە و لە زۆر کاری پیشەسازیدا بە کاری دەبەن ٢. هەرکام لەو ماکە جۆراوجۆرە دەسکردانەی وەک لاستیک ▤ ١و٢. کائوچو

**کاودان / kawdan/**: ناو. ١. خۆیانی گێرەکراوی بە با نەدراو ٢. [کینایە] پیت و بەرەکەت ▤ ١. خرمن باد نداده ٢. برکت

**کاودز / kawdiz/**: ناو. چکی جگ؛ قاپێ کە دیوی قووڵی ڕوو بە بان بێ ▤ حالت بر پشت افتادەی شتالنگ

**کاورا / kawra/**: ☜ **کابرا**

**کاوراکە / kawrake/**: جێناو. گۆڕین؛ گۆیین؛ ئەو کەسە کە ▤ یارو؛ فُلانی

**کاوران / kawran/**: ☜ **کاروان**

**کاوڕ / kawiř/**: ناو. کاڤر؛ بەرخی لە دایک دابڕاو کە شیر ناخوا و پووش دەخوا ▤ برەی از شیر بُریده

**کاوس / kawis/**: ناو. شەوە؛ مۆتەکە ▤ کابوس

**کاوش / kawiş/**: ئاوەڵناو. نائاسایی؛ پێچەوانەی سرشتی؛ نەگونجاو دەگەڵ دام و دەستووردا ▤ غیرعادی

**کاوشت / kawişt/**: ☜ **کاوێژ**

**کاوشک / kawişk/**: ئاوەڵناو. بیژۆک؛ زگپڕ بەر لە کاتی خۆی ▤ حامله قبل از موقع

**کاوشکی / kawişkî/**: ناو. زگپڕی بەر لە کاتی خۆی ▤ حاملگی زودرس

**کاوک / kawik/**: ناو. جومگەی دەست و پا ▤ مُچ دست و پا

**کاوکۆت / kawkot/**: ناو. پووشوپەلاش؛ دڕکوداڵ ▤ خس‌وخاشاک

**کاول[1] / kawil/**: ناو. کاڤل؛ چوار دیواری سەر نەگیراو ▤ چهاردیواری سرنپوشیده

**کاول[2]**: ئاوەڵناو. کاڤل؛ کایل؛ کەییل: ١. ویران ٢. [مەجاز] بێهۆش و گۆش ▤ ١. ویران ٢. پرت

◘ **کاول بوون**: خاپوور بوون ▤ ویران شدن

**کاول کردن**: خاپوور کردن ▤ ویران کردن

**کاولاش / kawlaş/**: ناو. کاڤلاش: ۱. خانوویێ کە بۆ ئاش چێ کراوە ۲. [کینایە] خانووی نەوی و پچووکی فەقیرانە ☰ ۱. ساختمان آسیاب ۲. کلبەی مُحقّر

**کاولان / kawlan/**: ناو. ۱. ☞ **کالان۲-۱** ۲. چەند ئۆدەی سەرنەگیراو ☰ ۱. ☞ **کالان۲-۱** ۲. اتاق‌های سرنپوشیده

**کاولە / kawle/**: ناو. کەلاوە؛ وێرانە؛ ماڵی ڕووخاو ☰ ویرانه

**کاولەدەم / kawledem/**: ئاوەڵناو. [پێلار] دەم‌پووچەڵ؛ تایبەتمەندی کەسێ کە ددانی لە دەمدا نەمابێ ☰ بی‌دندان

**کاولی / kaw(i)lî/**: ☞ **کاوڵی**

**کاوڵی / kaw(i)łî/**: ناو. کاولی؛ کەولی؛ کێوەلی: ۱. خێلاتێکی کۆچەری گەڕیدە ۲. [کینایە] کچی بێ‌شەرم ☰ ۱. کولی ۲. دختر بی‌حیا

**کاوە / kawe/**: ناو. کاو؛ چۆنیەتی سووتانەوەی پێست ☰ سوزش پوست

**کاوەتر / kawetir/**: ☞ **کۆتر۱**

**کاوەتری / kawet(i)rî/**: ☞ **کۆتر۱**

**کاوەخۆ / kawexo/**: ناو. پشوودرێژی؛ لەسەرخۆیی ‹وەلامی دامەوە بولبول، بە شێنەیی، بە کاوەخۆ/ گوتی نانالێنم بۆ گول، کە سیس بووە، دەزانی بۆ؟ «هێمن»› ☰ شکیبایی

**کاوەکاو / kawekaw/**: ناو. ۱. چۆنیەتی برژانەوەی. پێست؛ سووزیانەوە ‹پێستم هەر کاوەکاویەتی› ۲. شیوەن و ڕۆڕۆ ☰ ۱. سوزش زیاد پوست ۲. گریه و زاری

**کاوەلی / kawelî/**: ناو. دۆمی؛ قەرەچ؛ قەرەچی؛ قەرەچ ☰ کولی

**کاوەمەلەیی / kawemeleyî/**: ناو. سێوی کاغەزی؛ جۆرێک سێوی وردی سپییە، سەرەتای هاوین دەگا ☰ نوعی سیب

**کاوەن / kawen/**: ناو. تاق؛ میچ ☰ سقف

**کاویان / kawyan/**: چاوگ. ۱. سووزیانەوەی پێست ۲. گریان بە دەنگی نزم ☰ ۱. احساس سوزش کردن پوست ۲. مویه کردن؛ آرام گریستن

**کاویانەوە / kawyanewe/**: چاوگ. سووزیانەوە ☰ احساس سوزش کردن

**کاویای / kawyay/**: چاوگ. قەڵشان؛ تلیشیان ☰ شکافته شدن

**کاویت / kawît/**: ناو. قاوت؛ قاویت؛ پۆخین؛ بواردوو؛ ئاردی دەخڵی برژاو بە شەکر و بەهاراتەوە ☰ قاووت

**کاویچ / kawîç/**: ☞ **کاوێژ**

**کاویر / kawîr/**: ناو. حوشترالۆک؛ حوشترئالووک؛ وشترخۆرکە؛ وشترخار؛ وشترخوەرە؛ ستری‌شینکە؛ ستری‌شینک؛ بنەگیایەکی گەلاجووتی دوور لە یەکە بە دڕکی درێژ و سەوزەوە، ماکێکی شیرین بە ناو تورەنجەبین دەدەڵێنێ ☰ خارشتر

**کاویژ / kawîj/**: ☞ **کاوێژ**

**کاوین / kawîn/**: ناو. نکا؛ مارەیی؛ میەرە؛ ئەو پارە پیاو کاتی ژن خواستن بڕیار دەدا بە ژنی بدا ☰ مهریه

**کاوینەوە / kawînewe/**: چاوگ. کاوێژ کردن؛ پۆرساندن ☰ نشخوار کردن

**کاوێ / kawê/**: ئاوەڵناو. ۱. گەوج؛ نەفام ۲. خەرەفاو؛ هورفی ‹حەیفە گەورەکچ بۆ پیاوی کاوێ/ خوا هەڵینەگرێ، چت وا هەر ناوێ «فولکلۆر»› ☰ ۱. ابله ۲. خرفت

**کاوێر۱ / kawêr/**: ناو. پۆشەر؛ ئەوەی بۆ داپۆشین بە سەر شتێکدا دەیکێشن ☰ کاور؛ پوشش

**کاوێر۲**: ئاوەڵناو. ۱. سرک و بەلەپا ۲. ئازا و وریا ☰ ۱. رموک و تیزپا ۲. چابک

**کاوێز / kawêz/**: ناو. پلنگ؛ پالنگ ☰ پلنگ

**کاوێژ / kawêj/**: ناو. کائین؛ کاویچ؛ کـایی؛ کـاویژ؛ قاویچ؛ قاویچ؛ قاویش؛ کاوش؛ کاوشـت؛ قـاوێش؛ قایوشت؛ قاووش؛ قاوشت؛ ژا؛ ژاو؛ مشوت؛ کنشت؛ وەکار؛ ڕەوتی جاوینەوەی پەڵخۆر ☰ نشخوار

▣ **کاوێژ کردن**: ١. پۆرساندن؛ کاوینەوە؛ کاوانـەوە؛ وەکاریان؛ ڤەجین؛ کـایین؛ ڤـەکایین؛ قـاووش کردن؛ جاوینـەوەی پەڵـخۆر ٢. *[پلار]* مزەمـز کردن؛ ڕیوەڕیو کردن؛ چـەن‌پاتـە کردنـەوەی قسـەی بـێ‌تـام ٣. *[پلار]* قسـەی بـن‌فـش و نـــەگونجاو کـــردن ☰ ١. نشـــخوار کـــردن ٢. ژاژخاییدن ٣. یاوە گفتن

**کاوێژکـەر / kawêjker/**: ئاوڵـــناو. ١. ڤـــەکایی؛ تایبەتمەنـــدی دەســـتەیەک لـــە گوانـــدارانی جووتسم (وەک: گا، وشتر، ئاسک، پـەز، بـزن و...) کـە ئـەوی دەیخـۆن نایجـاون، قـووتی دەدەن و دیســـانەوە هەڵـــیدێنێنەوە نـــاو دەم و ئـــەمجار دەیجاون ٢. *[پلار]* تایبەتمەندی کەسێ کە قسەی زۆر و بێ‌تام دەکا ☰ ١. نشخوارکننده ٢. ژاژخا

**کاهڕوبا / kahřuba/**: ☜ **کارەبا**

**کاهو / kahû/**: ناو. کیـور؛ کیـوەر؛ کییـور؛ کیـور؛ مارول؛ خـاس؛ گیایـەکی یەکسـالانە گـەڵاپان و ئاودارە بە گوڵی زەرد و سـاقەتەی ناسـکەوە کـە هەمووی بە کاڵی دەخورێ ☰ کاهو

**کاهـور / kahûr/**: نـاو. قـام؛ قەممـە؛ تیخێکـی دەم‌پانە لە نێوان خەنجەر و شیردایە ☰ قمه

**کاهووەکەرانـە / kahûwekerane/**: نـاو. شـەنگاڵ؛ شەنگار؛ پێکۆترە؛ چەرمەژووری؛ گوڵەئەشـکەوت؛ گیایەکی دەرمانییە ☰ شنگار

**کاهەرزانی / kaherzanî/**: ناو. جـۆرێ هـەنجیر ☰ نوعی انجیر

**کاهی / kahî/**: ناو. جۆرێ نانی زۆر تـەنک کـە بـە ئارد و ڕۆن و سەرتۆی شیر دروسـت دەکـرێ ☰ نوعی نان از آرد و روغن و سرشیر

**کاهێڵ / kahêł/**: ئاوەڵناو. کایەڵ؛ تەمەڵ؛ تـەوەزەل ☰ کاهل

**کـاهێن / kahên/**: نـاو. ١. لـە پلەگـەلی دیـنی جوولەکە ٢. مەلای ئایینی بت‌پرست و بوودایی و جوو و چەند دینی‌تر ٣. مەلای میللەتانی پێشـوو (وەک بابیل و میسر) ☰ ١تا٣. کاهن

**کای[1] / kay/**: ناو. ١. هەڵپەڕکێ؛ سـەما ٢. گاڵـتە؛ حەنەک ٣. کایە؛ وازی منالان ☰ ١. رقص گروهی ٢. مزاح ٣. بازی کودکانه

**کای[2]**: جێناو. کامە؛ کێهە ☰ کدام

**کایکەردۆخ / kaykerdox/**: ئاوەڵـناو. ١. داوەتگێـڕ؛ تایبەتمەندی کەسێ کە زۆر باش هەڵدەپەڕێ ٢. حەنەکچی؛ قسە سـەیر ٣. فێڵـباز؛ گزیکـار ☰ ١. رقاص ٢. بذله‌گو ٣. نیرنگباز

**کایل / kayil/**: ☜ **کاول[2]**

**کایلان / kaylan/**: ☜ **کالان[2]ـ١**

**کایلۆش / kayloş/**: نـاو. شێوی کەشـکی تـراو کـە نانی تێدەکوشن ☰ کالجوش

**کاین / kayn/**: جێناو. کام؛ کامە؛ کێهـە؛ کـامین ☰ کدام

**کایە / kaye/**: ناو. ١. یـاری؛ بـازی ٢. حـەلێ لـە یاری ٣. تەتەڵەمیران؛ جۆرێ کرمە ☰ ١. بازی ٢. گیم؛ یک دور بازی ٣. نوعی کِرم

▣ **کایە کردن**: گەمە/ یاری کردن ☰ بازی کردن

**کایە پێ کردن**: ١. بە شتێ یاری کردن ٢. گاڵتە پێ کردن؛ کردنە مایەی سووکایەتی و گاڵـتە. هەروەها: **کایە پـێ کـران** ☰ ١. بـازی کـردن بـا چیزی ٢. بە بازی گرفتن

**بوونە کایە**: کەوتنە بەر گاڵتە و سـووکایەتییەوە ☰ مورد تمسخر قرار گرفتن

**هاتنە کایە/ کایەوە**: داهاتن؛ هاتنـە پێشـەوە ☰ بە میان آمدن

**کایەکلێ / kayak(i)lê/**: ناو. لەیستۆک؛ بووکەڵـەی

زارۆکان ☰ اسباب‌بازی

⊡ **کایەکلێ نەبوون**: شۆخی نەبوون؛ جێ مەترسی بوون ‹کاکە ماڵ کردنەوە کایەکلێ نییە، زەحمەتە› ☰ شوخی‌بردار نبودن

**کایەگا / kayega/**: ناو. گۆڕەپان؛ تەختایی جێگەی بازی کردن ☰ میدان بازی

**کایەڵ / kayeł/**: ☜ **کاهێڵ**

**کایەن / kayen/**: ☜ **کادێن**

**کایی**[1] **/ kayî/**: ☜ **کاوێژ**

**کایی**[2]: ئاوەڵناو. ١. دروستکراو لە کا ‹کاغەزی کایی› ٢. بە ڕەنگی کا ☰ ١و٢. کاهی

**کایین / kayîn/**: چاوگ. قاویش کردن؛ کاوێژ کردن ☰ نشخوار کردن

**کبار / k(i)bar/**: ئاوەڵناو. ١. بە حورمەت؛ بەڕێز ٢. بەفیز؛ بادیھەوا ☰ ١. مُحترم ٢. مُتکبر

**کبریت / kibrît/**: ☜ **کرمیت**

**کبیسە / k(i)bîse/**: ☜ **کەبیسە**

**کپ**[1] **/ kip/**: ئاوەڵناو. ١. کیپ؛ بەبێ مەودا و بۆشایی ‹سەری کپ کە! با نەڕژێ› ٢. تایبەتمەندی گوێیەک کە نەبیسێ ‹گوێم کپ بووە، هیچ نابیسم› ٣. ئۆقرەگرتوو؛ داسەکناو ‹ئەمرۆ زارۆڵەکەت کپە! نەخۆش نەبێ› ٤. بێدەنگ؛ خپ؛ ساکت ‹گۆڕخانەنشینان کە لە بن سەرپۆشن/ خۆڕایی نییە وەها کپ و خامۆشن «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ٥. *[زمانناسی]* بێدەنگ؛ نەجووڵ؛ تایبەتمەندی هێندێک لە دەنگەکانی زمان ٦. لە ڕەبەتا خۆ ماتەداو ☰ ١. کیپ ٢. ناشنوا ٣. خاموش؛ بی‌سروصدا ۴. ساکت ۵. صامت؛ بی‌صدا؛ ساکن ۶. کمین‌کرده

⊡ **کپ بوون**: ١. کەڕ بوونی گوێ ٢. بێدەنگ بوون ٣. داسەکنان ✱ هەروەها: **کپ کردن** ☰ ١. کر شدن ٢. ساکت شدن ٣. آرام گرفتن

**کپ**[2]: ئاوەڵکار. مووبڕ؛ بێ کەموکووڕی؛ بە شێوەی بێ بۆشایی ‹حاجی خانم ڕوومەتی کپ دەگرد› ☰ کیپ

**کپبوو / kipbû/**: ئاوەڵناو. ١. داخراو بە سەر یەکدا ٢. ماتەهەڵگرتوو ☰ ١. کیپ‌شدە ٢. کزکردە در کمین

**کپەنە / k(i)pene/**: ئاوەڵناو. ١. بێدەنگ؛ خپ ٢. ئارام؛ ئۆقرەگرتوو ☰ ١. ساکت ٢. آرام

**کپی / k(i)pî/**: ناو. ١. بێدەنگی ٢. ئارامی ☰ ١. خاموشی ٢. آرامی

**کپیان / kipyan/**: چاوگ. ١. ماندوو بوون؛ فل بوون ٢. بێدەنگ مانەوە ☰ ١. خستە و کوفتە شدن ٢. ساکت شدن

**کت**[1] **/ kit/**: ☜ **کتری**

**کت**[2]: ئاوەڵناو. ١. گت؛ قیت؛ زۆپ ٢. تەک؛ تاک؛ تەنیا ٣. کەرت؛ لەت ٤. تاق؛ تاکبەتاق؛ تایبەتمەندی ژمارەیێ کە نەبێتە دوو بەشی بەرامبەری ساخەوە ☰ ١. برجستە ٢. تنها ٣. پارە ۴. فرد

**کتارو / k(i)tarû/**: ناو. شیوەن؛ شین ☰ شیون

**کتاڤ / k(i)tav/**: ☜ **کتێب**

**کتان / k(i)tan/**: ☜ **کوتان**[1]

**کتاو**[1] **/ k(i)taw/**: ☜ **کتێب**

**کتاو**[2]: ئاوەڵناو. کوتراو؛ کوتیاگ ☰ کوبیدە

**کتبکت / kitb(i)kit/**: ئاوەڵکار. یەک‌بەیەک ☰ تک‌بەتک

**کتبەچە / kitbeçe/**: ناو. کت‌وەچە؛ بەچکەپشیلە ☰ بچەگربە

**کتبەها / kitbeha/**: ناو. نرخی تاک، نە بە تێکڕایی ☰ بهای واحد

**کتتە**[1] **/ kitte/**: ناو. کتە؛ هەودا بەنی پس‌پس؛ لەت و پەتی دەزوو ☰ تکەهای نخ

**کتتە**[2]: دەنگ. ١. کتکە؛ ختە؛ وشەی دەرکردنی پشی ٢. وشەیەکە وەختێ زارۆ ئەکۆخێ دەس لە پشتی ئەدەن و ئەیڵێن ☰ ١. پیشتە؛ کلمەی راندن

گربـه ۲. کلمـه‌ای اسـت در جـواب سُـرفه‌ی بچـه می‌گویند

**کتخ** / kitx/: ناو. بیزه؛ سیراج ☰ شیراز (از لبنیات)

**کتر** / k(i)tir/: ناو. بنی گیای لیلـک کـه قه‌لـه‌می قامیشی لیٚ چیٚ ده‌که‌ن ☰ ریشه‌ی قلم نی

**کترم** / k(i)tirm/: ئاوه‌لکار. کترمی؛ به گشـتی؛ بـه تیکڕایی ☰ روی هم؛ همه با هم

**کترمی** / k(i)tirmî/: ☜ **کترم**

**کتره** / kitre/: ☜ **که‌تیره**

**کتری** / kitrî/: ناو. که‌تری؛ که‌تلی؛ کتلـی؛ کتریـه؛ کت؛ قه‌رەوانه؛ ده‌فری کانزایی به سه‌ره و ده‌سته و لووله‌وه بۆ تراو تیٚدا کولاندن ☰ کتری

**کتریه** / k(i)triye/: ☜ **کتری**

**کتک** / k(i)tik/: نـاو. کـت؛ کتـه؛ کـه‌تک؛ کیٚتـک؛ پشیله؛ پسیک؛ پشی ☰ گُربه

**کتکـاگۆڕا** / kitkagoŕa/: نـاو. کونده‌بـه‌بوو؛ کونـد؛ بایه‌قوش ☰ جُغد

**کتکاڵ** / kitkał/: ئاوه‌لناو. خۆ به‌نازکـه‌ر؛ بـه‌نازونووز ☰ ملوس

**کتکشـۆر** / k(i)tikşor/: نـاو. پشیله‌شـۆر؛ کـاری شۆردنی سه‌رسه‌ری و ناته‌میس ☰ گربه‌شو

**کتکه** / kitke/: ☜ **کته**[۲]**ـ۱**

**کتکـه‌کۆره** / kitkekore/: ئاوه‌لـناو. [کینایـه] هـه‌ژار و لانه‌وازی جیٚـی بـه‌زه‌یی خه‌لـک ‹سـه‌دان سالـه کتکه‌کۆره‌ی گۆشه‌ی مدبه‌قی سولتانم «په‌شیٚو»› ☰ بینوای مورد ترحُم دیگران

**کتکه‌کیٚفی** / kitkekêfî/: ☜ **کتکه‌کیٚفیله**

**کتکه‌کیٚفیلـه** / kitkekêfîle/: نـاو. کتکـه‌کیٚفی؛ هووشک؛ گورواسه؛ کتکه کیٚفی؛ پشـیله کیٚـوی؛ کته‌هه‌ردیٚ؛ جۆریٚک پشیله‌ی گـه‌وره و سـووری گویٚ‌سووک که کـه‌وی ده‌سـتی مـرۆ نـه‌بووه ☰ گربه‌ی وحشی

**کتکه‌نه‌فتینـه** / kitkeneftîne/: ئاوه‌لـناو. [پـلار] کلکه‌نه‌فتینه؛ مایه‌فتنه؛ ئاژاوه‌چی ☰ مُفتن

**کتکه‌نیٚر** / kitkenêr/: نـاو. گوربه؛ گورپه؛ گفر؛ نیٚره پشیله ☰ گُربه‌ی نر

**کتکی** / kitkî/: ئاوه‌لناو. گه‌نیو؛ گه‌نیگ ☰ گندیده

**کتله** / kitle/: ناو. ماسه؛ ڕه‌مل ☰ ماسه

**کتلی** / kitlî/: ☜ **کتری**

**کتم** / k(i)tim/: ئاولناو. بیٚ‌پیٚناس ☰ بی‌شناسه

**کتوپڕ**[۱] / kit û piř/: ئاوه‌لناو. کوت‌وپڕ: ۱. له ناکاو؛ یه‌کهه‌و ناخافل ‹به‌لای کت‌وپڕ› ۲. گلاراوگوشتوو؛ قرپه‌لیٚ کـه‌وتوو؛ هاروهـاجی ئـازارده‌ر، به‌تایبـه‌ت منـدال ۳. بـه هیٚمـاوه بـۆ خۆشه‌ویسـتی، بـه که‌سیٚکی جوان‌پیٚکه‌وتوو، یان لیٚهاتووی ده‌لیٚن ☰ ۱. ناگهانی ۲و۳. ورپریده

**کتوپڕ**[۲]: ئاوه‌لکار. کوت‌وپڕ؛ له‌پڕ؛ له‌نکاو ‹کـه‌چی چ زوو، چ کت‌وپڕ لـه په‌نجـه‌یی وه‌ره‌مـا/ له‌شـی شـل و په‌مـه‌ییت، ئـه‌ی گولـی جـوان! ژاکـا «گـۆران»› ☰ ناگهان

**کتوپڕی** / kit û p(i)řî/: ئاوه‌لـناو. کـوت‌وپـڕی؛ بیٚ‌واده؛ بیٚ‌خه‌به‌ر ☰ ناگهانی

**کـتوکویٚر**[۱] / kit û k(i)wêr/: ئاوه‌لـناو. [پـلار] کته‌کوور؛ که‌م‌بین؛ چاو پرووش ☰ کم‌سو

**کتوکویٚر**[۲]: ئاوه‌لـکار. [پلار] کتـه‌کوور؛ کویٚرانـه ☰ کورانه

**کتومت**[۱] / kit û mit/: ئاوه‌لکار. کـوت‌ومـت؛ هـه‌ر وه‌ک ☰ عیناً

**کتومت**[۲]: ئامراز. کوت‌ومـت؛ وه‌ک؛ وه‌کـوو؛ عـه‌ین ‹کت‌ومت خۆت منیش نه‌خۆشم› ☰ درست مانندِ

**کتووت** / kit û wit/: ناو. ورتکه نان بـۆ تیٚگوشـین ☰ ریزه نان ترید

**کتوه‌چه** / kitweçe/: ☜ **کت‌به‌چه**

**کتۆ** / k(i)to/: ئاوه‌لناو/ ئاوه‌لکار. چلۆن؛ چۆن ☰ چه طور

**کتۆر** / k(i)tor/: ئاوه‌لناو. به‌دبه‌خت ☰ بدبخت

**کتۆیی** / k(i)toyî/: ناو. چۆنیەتی؛ چلۆنایەتی ⇐ کیفیت

**کتوت**[1] / k(i)tût/: ناو. کۆلووی نان کە لە تەندوور دەکەوێ ⇐ فرزدق

**کتوت**[2]: ئاوەڵناو. کۆن و برشاوی (نان) ⇐ کپک‌زده (نان)

**کتە** / k(i)te/: ناو. ۱. ☜ **کتە**[1] ۲. ☜ **کتك**

**کتەکور** / k(i)tekûr/: ☜ **کت‌وکوێر**

**کتەهەردێ** / k(i)teherdê/: ☜ **کتکەکێفیلە**

**کتێ** / k(i)tê/: دەنگ. کچێ؛ بانگ لە ژن کردن لە خۆشەویستی ⇐ خطاب مهربانانەی زن

**کتێب** / k(i)têb/: ناو. کتاڤ؛ کتاو؛ کتێو؛ کدێب؛ پەڕاو؛ پەرتووک؛ کۆمەڵێک نووسراوە لە سەر پەڕەی کاغەز، پێست یان پاپیرووس و... ⇐ کتاب

**کتێبخانە** / k(i)têbxane/: ناو. کتێوخانە: ۱. جێگایەک کە تاقمێ کتێبی تێدا هەڵدەگرن ۲. بینایەک بە ئامێری پێویست (وەکوو کتێب، قەفەسە، پێڕست، ئەسکەمل و...) بۆ کۆکردنەوە و پاراستن و سوود وەرگرتن لە کتێب ‹کتێبخانەی زانستگا› ۳. قەفەسەی کتێب ⇐ ۱تا۳. کتابخانە

**کتێبۆک** / k(i)têbok/: ناو. ۱. سیپارە؛ کتێبی چکۆلە ‹کتێبۆکی مەشق› ۲. نامیلکە؛ کتێبێکی چکۆلە لە ٤٨ لاپەڕە کەمتر ‹کتێبۆکی ڕێنما› ⇐ ۱و۲. کتابچە

**کتێبۆکە** / k(i)têboke/: ناو. نامیلکە؛ سیپارە ⇐ رسالە

**کتێو** / k(i)têw/: ☜ **کتێب**

**کتێوخانە** / k(i)têwxane/: ☜ **کتێبخانە**

**کجیر** / k(i)cîr/: ناو. کوتەک؛ تێلای ئەستوور ⇐ چُماق

**کچ** / kiç/: ناو. کەچ؛ کەچ؛ کیژ؛ کەنیشک؛ کەینەک؛ کەینەکە؛ کناچێ؛ کەنی؛ کێنا؛ کنا؛ قز؛ قیز؛ قیزا؛ قیچ؛ ویچان؛ دۆت؛ دویت؛ دوت؛ دوەت؛ دت؛ دوەر: ۱. منداڵی مێوینەی مرۆ ‹منداڵەکەیان کچ بوو› ۲. خاما؛ کچ ئازەو؛ کەنیشکە عازەو؛ کلیل‌بەبەرۆک؛ مرۆڤی مێوینە کە هێشتا شووی نەکردووە ⇐ ۱. دختر ۲. دختر دم‌بخت

▣ **کچ هلی**: کەچ حەلی؛ زڕکچ؛ کچی هەوێ ⇐ نادختری

**کچانە** / k(i)çane/: ئاوەڵناو. کەچانی؛ کەنیشکانە؛ دوێتانە؛ کناچانە: ۱. پێوەندیدار یان سەر بە کچانەوە ‹جل‌وبەرگی کچانە› ۲. وەکوو کچان ‹ڕواڵەتی کچانە› ⇐ ۱و۲. دخترانە

**کچانی** / k(i)çanî/: ئاوەڵناو. *[پلار]* تایبەتمەندی کوڕێ کە ئاکاری ژنانەیە ⇐ ویژگی پسری کە رفتارش دخترانە است

**کچچی** / kiççî/: ناو. کچی؛ مەت؛ پلک؛ میمک؛ خوشکی باوک ⇐ عمّە

**کچفریوێن** / kiçf(i)rîwên/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* کچەوەرە؛ دڵی کچ بۆ خۆ بەر ⇐ دخترکُش

**کچک**[1] / k(i)çik/: ☜ **کچۆڵە**

**کچک**[2]: ☜ **کچکە**

**کچکا** / kiçka/: ئاوەڵناو. بەبن؛ کچ؛ کەنیشک ⇐ باکرە؛ دوشیزە

**کچ ـ کچ** / kiç kiç/: دەنگەناو. وەحا؛ ئۆحە؛ وشەی دەنگدانی ڕەشەوڵاخ ⇐ لفظ راندن گاو و گوسالە

**کچکە** / kiçke/: ئاوەڵناو. کچک؛ گچکە؛ چکۆلە؛ چکۆڵە؛ چکوولە؛ بچووک؛ بچکۆک؛ بیچگ ⇐ کوچک

**کچۆڵە** / k(i)çołe/: ئاوەڵناو. کچک؛ کچی چکۆلە ⇐ دخترک

**کچەتیو** / k(i)çêtîw/: ناو. ۱. کچی بێ‌باب ۲. *[کینایە، پلار]* کچی ڕوودار و نالەبار ⇐ ۱. دخترِ صغیر ۲. دختر بلا

**کچەتیوە** / k(i)çêtîwe/: ناو. [کینایە، پلار] چـەتیوە؛ جۆرێک جنێوە بە کچ ☰ نوعی فُحش به دُختران

**کچەزا** / k(i)çeza/: نـاو. کەنیشـکەزا؛ کناچـەزا؛ هـەرکام لـە منـداڵانی کچـی کەسـێک ‹ئـەوین کچەزای خاڵۆمە› ☰ دخترزاده

**کچەکێ** / k(i)çekê/: سارستە. وشەی دواندنی یەکتر لە نێو کچ و ژناندا ☰ کلمەی خطاب کـردن اُناث، یکدیگر را

**کچەناخۆ** / k(i)çenaxo/: ☜ **کچەهەڵەک**

**کچـەوەرە** / k(i)çewere/: ناوەڵنـاو. [مـەجاز] کچفریوێن؛ دڵی کچ بۆ خـۆ بـەر ‹کـەوا و پاتۆڵـی کچەوەرە› ☰ دخترکُش

**کچەهەڵەک** / k(i)çhelek/: نـاو. کچەناخۆ؛ کچ نا ئی خۆ؛ کچێ کە هەڵیانگرتۆتەوە ☰ دخترخوانده

**کچی** / k(i)çî/: ☜ **کچچی**

**کچێ** / k(i)çê/: دەنگ. کتێ؛ بانگ لە ژن کردن لە خۆشەویستی ☰ خطاب مهربانانه به زن

**کچێنە** / k(i)çênê/: ناو. ڕەشکێنە/ گلێنەی چاو ☰ مردُمک چشم

**کچێنی** / k(i)çênî/: ناو. کناچـەی؛ کەنیشـکی: ١. کچی؛ دۆتی؛ دۆخ یـان چۆنیـەتی کـچ بـوون ٢. [مـەجاز] بـن؛ بنـە؛ گـووت؛ گورتگـە؛ گورتینـە؛ تۆژاڵێکی ناسک لە شەرمی کچدا ☰ ١. دوشـیزگی ٢. پردەی بکارت

**کحێڵ** / k(i)ĥêł/: ناو. ئەسپی ڕەسەن ☰ اسب اصیل

**کخ** / kix/: ☜ **کخە**

**کختان** / k(i)xtan/: ناو. جێ تەپکە؛ جـێ تەڵـە ☰ دامگاه

**کخخە** / kixxe/: ☜ **کخە**

**کخس** / kixs/: ☜ **کەخس**

**کخە** / k(i)xe/: دەنگ. کخخە؛ قخ؛ کخ ☰ کلمـەی تحذیر بچه به معنی کثیف

**کخی** / k(i)xî/: ☜ **کەیخودا**

**کخیتی** / k(i)xîtî/: ناو. کەیخودایی؛ قوێخایـەتی ☰ کدخُدایی

**کدارک** / k(i)dark/: ناو. ١. ☜ **کارگـ١** ٢. چمە؛ دونبەڵان ٣. قاو؛ قـاڵ؛ پووشـووی دار ☰ ١. ☜ **کارگـ١** ٢. دُنبلان ٣. پده

**کداسە** / k(i)dase/: ناو. لۆدەی کا و ئالـف کـە لـە دەشت بۆ گلەبان کۆوە دەکرێ ☰ کاهِ کاهگل

**کدو** / k(i)du/: ناو. قولند؛ قوندک؛ کوولەکە ☰ کدو

**کدو** / k(i)dû/: ☜ **کەدوـ١**

▣ **کدوبارزانی**: ☜ **کولەکەسەراوی**

**کدوسـاندنەوە** / k(i)dûsandinewe/: ☜ **کرووساندنەوە**

**کدی**[1] / k(i)dî/: ناوەڵناو. کەوی؛ ڕام؛ دەسەمۆ ☰ رام

**کدی**[2]: دەنگ. وتەی بانگ کردن لە کاریلە ☰ لفـظ خواندن بُزغاله

**کدێ** / k(i)dê/: ناوەڵکار. ١. چ وەخت؛ کام دەم ٢. لە کام جێ ☰ ١. کَی ٢. کُجا

**کدێب** / k(i)dêb/: ☜ **کتێب**

**کر**[1] / kir/: نـاو. ١. دەسـکار ‹پەیـدا دەبـوو ڕێـز و گەورەیی و ناو/ ڕەنگ و کری مەش دەهاتە بـەر چـاو «هەژار، *مەم و زین*»› ٢. تەنراوە ٣. ڕایەڵـی تـەون ٤. [شوورەیی] کێر؛ ئەندامی نێرایەتی ☰ ١. سـاخت ٢. بافته ٣. تار (بافت) ۴. آلت تناسلی نر

**کر**[2]: ناوەڵناو. کورت؛ کۆتا ☰ کوتاه

**کر**[3]: دەنگەناو. نرکە؛ دەنگی بەقەوە ☰ صدای مهیب

▪ **کر**[4]: پاشەوشە. ـ کەر ‹چێکر› ☰ کننده

**کرا** / k(i)ra/: ناو. ١. کرێ؛ کراهـە؛ ئیجـارە ‹چـل ساڵ وە ئیران زندگی کـەردم/ کـرای زەمـین دەم وە بانی گەردم «شامی»› ٢. حەقی کار ☰ ١. کرایه ٢. مُزد

**کراپـا** / k(i)rapa/: نـاو. کراهـەپا؛ کاڵـەدڕانە ☰ پایمُزد

**کراری** / k(i)rarî/: ناوەڵناو. کارزان ☰ ماهر

**کراز / k(i)raz/:** ☜ **کراس-١**

**کراژ / k(i)raj/:** ناو. تفره؛ کرێش ▪ پوسته؛ شوره

**کراس / k(i)ras/:** ناو. ١. کراز؛ کرواس؛ کوراس؛ کەراس؛ قوڵتە؛ گجی؛ گجک؛ جوە؛ جوومە؛ گوملک؛ شەوی؛ متیان ٢. کێشانەیەکە بە گرانایی بیست و پێنج فیشەکی پێنجتیر بە بەستەوە ▪ ١. پیراهن ٢. وزنی است

**کراسبەز / k(i)rasbez/:** ناو. مەراق؛ پریتۆنیوم؛ پەردەیەکی ناسکی سیرۆزییە، هەناو (جەرگ، ڕیخۆڵە و...) دەپۆشێ ▪ صِفاق

**کراسە / k(i)rase/:** ناو. جۆش هاتنی چەورایی پیوی سابوون ▪ فرایند جوش آمدن چربی پیه در صابونسازی

**کراشە / k(i)raşe/:** ناو. مۆم ▪ موم (عسل)

**کراڵ / k(i)rał/:** ئاوەڵناو. کرێڵ؛ قاقڕ ▪ بی‌گیاه

**کران / k(i)ran/:** چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //کرای؛ دەکرێ؛ بکرێ// کریان؛ جێبەجێ بوون؛ ئەنجام دران ▪ انجام شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: کراو/ چاوگی نەرێنی: نەکران

**کرانتی / k(i)rantî/:** ناو. ١. زەرداو؛ زەرتاڵ؛ تالاو؛ سەفرا؛ خەرداو؛ زێلک؛ هژ؛ تراوی زەردی مەیلەو سەوز و تاڵ کە لە جەرگەوە دەڕژێتە دوازدەیینە و چەوری دەتوێنێتەوە ٢. ژەهر؛ زەهر؛ ژار ▪ ١. صفرا ٢. زهر

**کراندن / k(i)randin/:** چاوگ. ئەرک کێشان ▪ زحمت کشیدن

**کرانشین / k(i)ran(i)şîn/:** ناو. کرێنشین؛ کەرانشین؛ کرایەنشین؛ کرێهانشین؛ کرێگرتی؛ ماڵگر؛ کرێدار؛ کرێچی؛ کەسێ کە لە جێگایەکی کرێدراو نیشتەجێیە ▪ اجارەنشین

**کرانشینی / k(i)ran(i)şînî/:** ناو. کرێنشینی؛ کرێهانشینی؛ حاڵوباڵی ماڵ نەبوون و بە کرێ لە جێیەکدا مانەوە ‹چە بکەم وە دەس کرانشینی/ داد وە هەر کەس بەم، حەقم نیەسینی «شامی»› ▪ اجارەنشینی

**کرانەوە / k(i)ranewe/:** چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //کرایەوە؛ دەکرێیەوە؛ بکرێوە// کریانەوە: ١. دووبارە ئەنجام دران؛ دووبارە کران ٢. باز بوون ‹درگاکە کراوە› ٣. سازران؛ دروست کران ‹بەم ئاسانییە ماڵ ناکرێتەوە› ▪ ١. باز انجام داده شدن ٢. باز شدن ٣. بنا شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: کراوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەکرانەوە

**کراو / k(i)raw/:** ئاوەڵناو. پێکهاتوو؛ ئەنجامدراو ▪ انجام شده

**کراوات / k(i)rawat/:** ناو. کەراوات؛ کەرەوێتە؛ قەرەوێتە؛ بۆینباخ؛ بەندک ▪ کراوات

**کراوە[1] / k(i)rawe/:** ئاوەڵناو. ١. ئاواڵە؛ باز ‹فرۆشگا کراوەیە› ٢. شی‌کراو؛ بە هەلاجی‌کراو ▪ ١. باز ٢. زده شده (الیاف)

**کراوە[2]:** ئاوەڵکار. بە ئاشکرا؛ بە ڕاشکاوی ‹دانیشتنی ئەمڕۆی پارلەمان کراوە بەڕێوە چوو› ▪ علنی

**کراوی / k(i)rawî/:** ناو. کراویە؛ گیایەکی بۆنخۆشە ▪ گیاهی خوشبو

**کراویە / k(i)rawye/:** ☜ **کراوی**

**کراها / k(i)raha/:** ☜ **کراهە**

**کراهە / k(i)rahe/:** ناو. کرێ؛ کرا؛ کراها ▪ اجارە

**کراهە پا / k(i)rahepa/:** ☜ **کراپا**

**کرایەنشین / k(i)rayen(i)şîn/:** ☜ **کرانشین**

**کربیت / kirbît/:** ☜ **کرمیت**

**کرپ[1] / k(i)rip/:** ناو. جۆرێ قوماش ▪ نوعی پارچە

**کرپ[2]:** ئاوەڵکار. لەپڕ و نەکاو ▪ ناگهان

**کرپ[3]:** دەنگەناو. کرپە؛ دەنگی وەک ددانان کە شتێ وردە ــ وردە دەشکێنن ▪ صدای خاییدن دندان

**کرپک / kirpik/:** ناو. درشتەی ئارد لە دابێژاندا ▪

نُخالەی آرد

**کرپە / kirpe/**: دەنگەناو. ١. دەنگی شکانی شتی ناسک ٢. ☜ **کرپ**[3] ≡ ١. صدای شکستن شیء نازک و ترد ٢. ☜ **کرپ**[3]

**کرت**[1] **/ kirt/**: ناو. ١. لەلە؛ شوێن بە تیخ لە دار ٢. چۆنیەتی سەر هەڵپساندنی گوڵ و گیا ٣. بێچووی سەگ و گورگ ≡ ١. چوب خط؛ شیار بر چوب ٢. چیدن سرِ گُل و گیاه ٣. تولەی سگ و گرگ

⊡ **کرت کرن** شوێن ـ شوێن کردنی دار بە تیخ ≡ چوب خط زدن

**کرت**[2]: دەنگەناو. ١. قرت؛ دەنگی قرتان ٢. نقە؛ کەمترین دەنگ ≡ ١. صدای شکستن یا گُسستن با دندان ٢. جیک؛ کمترین ندا

**کرتاڵ / kirtał/**: ناو. کاناڵ؛ کەنداو؛ جێگای دەسکرد بۆ ڕۆشتنی ئاو ≡ کانال

**کرتان**[1] **/ kirtan/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //کرتای؛ دەکرتێی؛ بکرتێ// کرت کردن؛ کرتیای؛ سەر هەڵپساندنی ڕووەک ≡ چیدن سر گل و گیاه

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: کرتاو/ چاوگی نەرێنی: نەکرتان

**کرتان**[2]: ئاوەڵناو. خەسیو؛ خەسیاگ (نێرە گامێش) ≡ اخته شده (گاومیش)

⊡ **کرتان کرن** خەساندنی کەڵگامێش ≡ اخته کردن گاومیش

**کرتاندن / kirtandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //کرتاندت؛ دەکرتێنی؛ بکرتێنە// کرووتاندن؛ کەرتاندن؛ کرتنای: ١. بڕین؛ قەت کردن (وەک: بە ددان) ٢. ترووکاندن؛ تەقاندن (وەک: تۆم) ٣. قرتاندن؛ بە گاز یان قەیچی لەت کردن ≡ ١. با دندان بُریدن ٢. تخمه شکستن ٣. با انبر یا قیچی بریدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەکرتاندن

**کرتک**[1] **/ kirtik/**: ☜ **کرۆژنە**

**کرتک**[2]: ئاوەڵکار. ١. کەمێک؛ پاژێکی کەم ٢. تاقێک؛ دانەیەک ≡ ١. اندکی ٢. یک عدد

**کرتم / kirtim/**: ناو. پارچە داری بێکارە ≡ تکە چوب بی‌مصرف

**کرت ـ مرت / kirt mirt/**: ☜ **کەلوپەل**

**کرتناک / kirtnak/**: ناو. تیرەنان؛ تیرۆکی نان ≡ چوبک نانوایی

**کرتنای / kirtnay/**: ☜ **کرتاندن**

**کرتوپ / kirtup/**: ناو. سێفزەمینە؛ سێفەزەوینە ≡ سیب‌زمینی

**کرتوپان / kirtupan/**: ناو. جلکی خراپ درواو ≡ لباس بدوخت

**کرتۆپل / kirtopil/**: ☜ **کارتۆڵ**

**کرتۆپە / kirtope/**: ناو. پەتاتە؛ سێفزەمینە ≡ سیب‌زمینی

**کرتۆفل / kirtofil/**: ☜ **کارتۆل**

**کرتو / kirtû/**: ناو. زەل؛ گیایەکە باقەی پێ دەبەستن ≡ گیاهی برای بستن بافەی علوفە

**کرتە**[1] **/ kirte/**: ناو. ١. چەقۆی دەستی پینەچی کە چەرمی پێ دەبڕێ ٢. ☜ **کرۆژنە** ٣. بەچکەی سەگ و گورگ ≡ ١. چاقوی چرم بُریدن ٢. ☜ **کرۆژنە** ٣. تولەی سگ و گرگ

**کرتە**[2]: دەنگەناو. کرتەکرت؛ دەنگی قرتان ≡ صدای قطع شدن

**کرتەک / kirtek/**: ناو. بەفری تەڕی سەهۆڵبەستوو ≡ برفاب یخ‌بسته

**کرتەکرت / kirtekirt/**: دەنگەناو. دەنگی کرتی زۆر «... قەت تاقە مشکێکی بۆ دەرمانیش نەهێشت. ورکەنانمان بۆ دەرشتە بن تەخت، کرتەکرت دەیخوارد! «هەژار، چێشتی مجێور»» ≡ صدای پیاپی «کرت»

**کرتی / kirtî/**: ئاوەڵناو. سەرقرتاو (گیا) ≡ سرچیده (گیاه)

**کرتیای / kirtyay/**: ☜ **کرتان**[1]

**کرتێ / kirtê/**: ئاوەڵکار. ئەندازەیەک؛ ڕادەیەک

‹کرتێ پارەم لە سەریەتی› 📖 مقداری

**کرتێن / kirtên/**: ناو. خورۆک 📖 جونده

**کرتێنە / kirtêne/**: ناو. کرۆژە؛ کرۆچەنە 📖 غُضروف

**کرجلنگ / kirc(i)ling/**: ناو. قرژانگ؛ قرژاڵ 📖 خرچنگ

**کرچ[1] / kirç/**: ناوەڵناو. ١. کاڵ؛ نەگەیشتوو ٢. نەکولاو ٣. سیس و چرچ 📖 ١. کال ٢. ناپخته ٣. چروکیده

**کرچ[2]**: دەنگ. دەنگی پژمە 📖 صدای عطسه

**کرچک / kirçik/**: ☜ **گەرچەك**

**کرچوکاڵ / kirç û kał/**: ناوەڵناو. تەواو نەگەییو 📖 کال

**کرچە[1] / kirçe/**: ناو. ١. قرشە؛ لقی درواوی خەلە ٢. پژمە؛ پونژین 📖 ١. ساقەهای درویدەی غله ٢. عطسه

**کرچە[2]**: دەنگەناو. ١. قرچە؛ دەنگی شکانی شتی ناسک ٢. دەنگی پشت و قامک 📖 ١. صدای شکستن چیز نازک ٢. صدای پشت و انگشت

**کرچەنە / kirçene/**: چاوگ. پژمین؛ پونژین؛ پشمین 📖 عطسه کردن

**کرچیان / kirçyan/**: چاوگ. سیس بوون؛ ژاکان 📖 پژمرده شدن

**کرخە / kirxe/**: دەنگەناو. پرخە؛ پرخەپرخ؛ خرپوق؛ خورخور؛ جۆرێ دەنگی هەناسەدان لە خەودا 📖 خُروپف

**کرد[1] / kird/**: ناو. ١. ☜ **کردوکۆش** ٢. پێکهاتوو؛ دروستکراو ‹کردی وەستای ئامێدە› ٣. کورد ٤. دوو هۆزی زازا و دملی ٥. ئیش؛ کار ٦. *[پلار]* بۆرەپیاگ (لە زاراوەی نەجیمزادانـدا) 📖 ١. ☜ **کردوکۆش** ٢. ساخت؛ ساز ٣. کُرد ۴. از عشیرەهای کُرد ۵. کار ۶ عوام؛ طبقەی پایین جامعه

• **کرد[2]**: پاشەوشە. دروستکراو ‹دەسکرد› 📖 ـ ساز

**کردار / kirdar/**: ناو. ١. کردەوە؛ ڕەوت؛ ئەوی لە کەسایەتی، هەست، خۆ یان بیر و بۆچوونی کەس یان تاقمێک لە بەر چاوە ‹هەر کەسێ کرداری باشە و بە باوەڕە، هەتا دەژی، وا دەکەین بە خۆشی بژی «هەژار، *قورئان*»› ٢. چاندراو؛ زرعات ‹کرداری ئەمساڵ شوکور زۆر چاکە› ٣. *[ڕێزمان]* کار؛ وشەیێ کە بەڕێوە چوونی کار یان بارودۆخێک لە ڕابردوو، ئێستا یان داهاتوودا نیشان دەدا 📖 ١. رفتار ٢. کشت ٣. فعل

◙ **کرداری تێپەڕ**: *[ڕێزمان]* کاری تێپەڕ؛ کارێ کە ئاکامەکەی ڕوو لە بەرکار دەکات (وەک: خواردن؛ خەواندن، غار پێدان) 📖 فعل متعدی

**کرداری تێنەپەڕ**: *[ڕێزمان]* کاری تێنەپەڕ؛ کارێ کە پێویستی بە بەرکار نییە (وەک: خەوتن، هەڵاتن) 📖 فعل لازم

**کرداس / kirdas/**: ناو. هەر کوردێ بە زاری کرمانجی داخێوی 📖 کُرد کرمانجی

**کرداسی / kirdasî/**: ناو. کرداشکی؛ زاری کرمانجی 📖 گویش کرمانجی

**کرداشکی / kirdaşkî/**: ☜ **کرداسی**

**کردانە / kirdane/**: ناو. *[کینایە]* کاری ئازایانە 📖 کار شجاعانه

**کردکی / kird(i)kî/**: ناو. شێوەزاری زازا و دملی 📖 از لهجەهای زبان کردی

**کردگار / kird(i)gar/**: ناو. ١. خودا؛ خوا؛ خودێ ‹نە کرمم بچمە ژێر زەوی/ نە باڵدارم بچمە ئاسمان/ ئەدی چ بکەم کردگاری کورد؟ «پەشێو»› ٢. سنعات؛ پیشە ‹کاری نییە، کردگاران دەکا/ گوێلکی نییە، هەوساران دەکا «مەسەل»› 📖 ١. خدا ٢. پیشه

**کردمان / kirdman/**: ناو. پێکهات؛ پێکهاتە 📖 ساختار

**کردن / kirdin/**: چاوگ. تێپەڕ. //کردت؛ دەکەی؛ بکە// کرن: ١. ئەنجام دان؛ پێک‌هێنانی کار ‹کار

کردن؛ شەڕ کردن› ۲. شبان؛ وێچوون ‹ئەو کوڕە لە کێ دەکا؟› ۳. پۆشین ‹کردنە پێ؛ کردنە سەر؛ کردنە بەر› ٤. هاڕین ‹ورد کردن› ٥. خستنە ناو ‹کردنە گیرفان› ٦. دۆخێک هێنانە پێشەوە ‹خراپ کردن› ۷. ئەرکێ بۆ کەسێ ئەنجام دان ‹برایی کردن؛ خزمەت کردن› ۸. گۆڕان؛ کردنەوە ‹گەورە کردن› ۹. کات بەسەر بردن ‹شەو کردنە ڕۆژ› ۱۰. کەوتنە دۆخ یان حاڵەتێک ‹یاو کردن› ۱۱. *[شوورەیی]* سەرجێیی کردن ۱۲. دروست کردن؛ چێ کردن ‹کەپرێکت بۆ بکەم لە بیاوانی پەڕ/ دارەڕای بکەم بە ڕەیحانی تەڕ «فولکلۆر»› ۱۳. دانان؛ هەڵڕژان ‹هێلکە کردن؛ تۆزێک خۆڵ بکە ئێرە› ١٤. *[ناشیرین]* دەردان ‹میز کردن؛ گوو کردن› ۱٥. دامەزراندن؛ دانان؛ کارێک بە کەسێک سپاردن ‹کردیانە سەرۆکی قوتابخانە› ١٦. **تێبینی:** لە حاڵەتی سەرفی «کردم» و «کردمان» واتا: دامانا؛ فەرزمان کرد ‹ئەوا کردمان ڕۆیشت و نەگەڕایەوە، ئەوجار چ بکەین؟› ☳ ۱. کردن؛ انجام دادن ۲. شباهت داشتن ۳. پوشیدن ۴. آسیاب کردن ۵. داخل کردن ۶. در حالتی قرار دادن ۷. کاری را برای کسی انجام دادن ۸. تغییر دادن ۹. سپری کردن ۱۰. در حالتی قرار گرفتن ۱۱. جماع کردن ۱۲. درست کردن ۱۳. گذاشتن ۱۴. دفع کردن ۱۵. منصوب کردن ۱۶. در حالت صرفی «کردمان» به معنی: «فرض کنیم»

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ــ/ چاوگی نەرێنی: نەکردن

**کردنەوە** / kird(i)newe/: چاوگ. ۱. دیسان کردن؛ ئەنجامدانەوە ‹پاک کردنەوە› ۲. ئاواڵە کردن ‹ئەو دەرکە بکەوە!› ۳. ڕایی کردنی گرێ ‹گرێیەکەم کردەوە› ٤. شی کردنەوە؛ هەلاجی کردن (کولکە و لۆکە) ‹هەلاجی چاکە، بە نیوەڕۆژێ چوار دۆشەکی کردەوە› ٥. چنینی میوە لە دار ‹دا هێندێ سێومان لەو دارە بۆ بکەوە!› ٦. سازین؛ دروست کردن ‹ئەمساڵ ماڵ دەکەینەوە› ☳ ۱. تکرار کردن کار ۲. باز کردن ۳. گشودن گره ۴. زدن (پشم و پنبه) ۵. چیدن میوه از درخت ۶ ساختن؛ بنا کردن

**کردوکاش** / kird û kaş/: ☜ **کردوکۆش**

**کردوکۆش** / kird û koş/: ناو. کردوکاش؛ کۆشش؛ هەوڵ؛ تەقالا؛ هەڵگ؛ هەڵک؛ کرد؛ مت ـ ملوو؛ تەلاش؛ پەلوپۆ؛ کار و ڕەوتی تێکۆشانی سەخت و زۆر بۆ گەیشتن بە ئامانج ☳ تلاش و کوشش

**کردوو**[۱] / kirdû/: ناو. ۱. کەرتوو؛ ورچ و لۆتی؛ بێڵ ئاسنێکی پانە دوو ئاڵقەی تێدایە پەتی تێ دەخرێ یەک دایدەگرێ یەک دەیکێشێ، بۆ دێراو هەڵدان ۲. تەختە ـ تەختە کراوەی زەوی بۆ چاندن ☳ ۱. گراز کشاورزی ۲. کرد کشاورزی

**. کردوو**[۲]: پاشەوشە. ـ کردە؛ بەجێهێناو؛ پێکهێناو ‹کۆچکردوو› ☳ ـکردە

**کردووکێش** / kirdûkêş/: ناو. کەردووکێش؛ ئەو کەسەی کردوو دەکێشێ ☳ گرازکش کشاورزی

**کردە**[۱] / kirde/: ناو. ۱. کردار؛ کردەوە ۲. کاری کراو ‹بە زەربی کوتەک و قامچی، کردە و نەکردەیان پێ کرد!› ☳ ۱. کردار ۲. عمل انجام شده

**کردە**[۲]: ئاوەڵناو. خاراو لە کار ☳ کارآمد

**. کردە**[۳]: ☜ **ـ کردوو**[۲]

**کردەوە** / kirdewe/: ناو. ۱. کەردە؛ کردار ‹خودا لە کردەوەی ئێوە ئاگادارە› ۲. کارکرد؛ کارکۆ ‹هەر کردەوەی من، بردەی ئاغا بێ/ هەتا کەی ئەبێ ئەم کارە وا بێ؟ «هەژار، *ئاڵەکۆک*»› ☳ ۱. کردار ۲. عملکرد

**کرزڵنگ** / kirzłing/: ناو. قرژانگ؛ قرژاڵ ☳ خرچنگ

**کرژ**[۱] / kirj/: ئاوەڵناو. گرژ: ۱. توند بادراو ‹سەر لەتەرەی خەم خول ئاوەردەوە/ تای کرژ مەینەت دووباد کەردەوە «مەولەوی»› ۲. قرچاو؛ هەڵقرچاو؛

چرچیاگ ٣. گورج؛ چوست و چالاک ٤. قرژ؛ لێکهالاو ٥. وێکهاتوو ‹ماسوولکەی کرژ؛ کرژ بوونی ماسوولکەکانی لەش› ☰ ١. پُرتاب ٢. چروکیده ٣. چالاک ۴. فرفری ۵. مُنقبض

▣ **کرژ بون:** کرژ هەلاتن: ١. توند باو خواردن (گشتەک و...) ٢. هەلقرچان؛ چرچیان ٣. تووڕە بوون ٤. لێکهالان (مووی سەر و...) ٥. وێک هاتن؛ هاتنە یەک ‹جوولەی لەش بەرهەمی کرژ و خاو بوونەوەی ماسوولکەکانە› ☰ ١. زیاد تاب خوردن رشته ٢. چروک شدن ٣. خشمگین شدن ۴. فرفری شدن (مو و...) ۵. مُنقبض شدن

**کرژ هەلاتن:** ☜ **کرژ بون**

**کرژ**[٢]: ئاوەلکار. گورج؛ خێرا؛ توند ‹کرژ بچۆ ئاو بێنە!› ☰ سریع

▣ **کرژ کردن:** زوو کردن؛ گورج و گولانە کار کردن ‹کرژ کە با بچین! دێرە› ☰ شتاب کردن

**کرژکەر** / kirjker/: ناو. بادەر ☰ ریسنده

**کرژنگ** / kirjing/: ☜ **قرژانگ**

**کرژوکۆڵ** / kirj û koł/: ئاوەلناو. گورجوگۆڵ؛ خێرا و بەکار ‹ئێننە کرژوکۆڵا بە دڤێ لاقۆرێ پرۆڤە› ☰ سرزنده و کاری

**کرژۆر** / kirjor/: ئاوەلناو. ڕژد؛ چکووس ☰ خسیس

**کرژە** / kirje/: ئاوەلناو. چوست و چالاک ☰ چالاک و آماده

**کرژەڵە** / kirjełe/: ☜ **کەکرە**

**کرژی** / kirjî/: ناو. ١. چۆنیەتی کرژ بوون ٢. بەرەس؛ بەڵەکی پێست ٣. خێرایی؛ گورجوگۆڵی ٤. وێکهاتوویی ☰ ١. تابیدگی ٢. برص ٣. سرعت ۴. انقباض

**کرس** / kirs/: ناو. گەرس؛ گەرش؛ زبلوزاڵ ☰ آتوآشغال

**کرسپ** / k(i)risp/: ☜ **کەرەوز**

**کرسنە** / kirsne/: ناو. گاینە؛ گادانە؛ گاودانە ☰ گاودانه

**کرش** / kirş/: ناو. ١. کەرش؛ عوور؛ ورگ ٢. گەرش؛ پووش و چیلکە ☰ ١. شکمبه ٢. کاه و گیاه خُشکیده

**کرش و گلیش** / kirş û g(i)lîş/: ناو. گەرش و گێل؛ چیلکە و چاڵ؛ پووش و پەلاش ☰ خس و خاشاک

**کرشە**[١] / kirşe/: ناو. ١. کلۆش؛ قرچە ٢. کوتکی هەرە زلی دەستی ئاسنگەر ☰ ١. ساقەی غلّە ٢. پُتک آهنگری

**کرشە**[٢]: ئاوەلناو. ورگزل؛ سکزل؛ زگدەرپەڕیو ☰ شکم‌گُنده

**کرک** / kirik/: ئاوەلناو. ١. دووڕەگە ٢. شکاو (پێشەی لەش) ☰ ١. دورگه ٢. شکسته (استخوان)

**کرک**[١] / kirk/: ناو. ١. دەشتی پان و بەرین ٢. مۆغەرەی پشت ☰ ١. هامون؛ دشت وسیع و هموار ٢. ستون فقرات

**کرک**[٢]: ئاوەلناو. ڕاست؛ ڕێک؛ ساف ‹لە ژوورمانەوە پردێکی ڕووخاو/ سێبەری کرکی ئەکرد بۆ پەنگاو «گۆران»› ☰ تخت

**کرکار** / kirkar/: ئاوەلناو. بکەر؛ بکرد؛ کرۆک ☰ فاعل

**کرکای کرک** / kirkay kirk/: ناو. دەشتی کاکیبەکاکی ☰ صحرای بی آب و علف

**کرکرتۆکە** / kirkirtoke/: ☜ **کرۆژنە**

**کرکرۆکە** / kirk(i)roke/: ☜ **کرۆژنە**

**کرکرووک** / kirk(i)rûk/: ناو. سێفزەمینە؛ سێفەزەوینە ☰ سیب‌زمینی

**کرکلاش** / kirk(i)łaş/: ناو. ١. خوروو؛ ئالۆش؛ کلاشە ٢. کاری خوراندن (بە نینۆک) ☰ ١. خارش ٢. عمل خاراندن

**کرکمازێ** / kirkmazê/: ناو. بربڕاگە؛ مۆرەغە ☰ ستون فقرات

**کرکه** / kirke/: ☜ **کورکه**

**کرکی** / kirkî/: ناو. وەستای شکستەبەند ⚐ اُستاد شکستەبندی

**کرگار**[1] / kirgar/: ناو. ١. پیشە؛ کسپ ‹دادەمەزرێنن لە گشت شاری وڵات کارخانەیەک/ تا بە دەستی خۆی ڕەنێو بێ بەرهەم و کرگاری کورد «هێمن»› ٢. کردار؛ ڕێوڕەوش ٣. خودا؛ خوا ⚐ ١. صنعت ٢. روش ٣. کردگار

**کرگار**[2]: ئاوەڵناو. بەدیهێنەر؛ خولقێنەر ‹کر گەر بوو دەزانی هەیشە کرگار/ بۆ هەر شتێ سازکەرێکە ناچار «هەژار، *مەم و زین*»› ⚐ سازندە

**کرم**[1] / kirm/: ناو. کرمی؛ کەلم؛ کارم؛ کورم؛ کەرم؛ قورم؛ نێوی هەر یەکە لە جانەوەرانی بێمۆرەغە، بە لەشی نەرم و ڕووت درێژەوە ⚐ کِرم

◘ **کرمی ئاوریشم**: تەتڵە؛ تەتڵەمیوە؛ کرمێ کە لیکاوەکەی دەبێتە هەودای ئاوریشم ⚐ کرم ابریشم

**کرمی گڵ**: کرمی گڵی: ١. کرمە سوورکە ٢. *[کینایە]* کەسێ زۆر خەریکی کشتوکاڵە ⚐ ١. کرم خاکی ٢. کشاورز پُرکار

**کرمی گڵی**: ☜ **کرمی گڵ**

◘ **کرم تێ دان**: کرم تێ کەوتن؛ کرم هەڵێنان؛ کرماوی بوون ⚐ کرمو شدن

**کرم تێ کەوتن**: ☜ **کرم تێ دان**

**کرم هەڵێنان**: ☜ **کرم تێ دان**

**کرم**[2]: دەنگەناو. دەنگی داکرۆشتن ⚐ صدای خاییدن

**کرماج** / kirmac/: ☜ **کرمانج**

**کرمان** / kirman/: چاوگ. تێپەڕ. //کرمای؛ دەکرمێ؛ بکرمێ// خرمیای؛ بە ددان کرۆژران ⚐ خُرد شدن با دندان

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: کرماو/ چاوگی نەرێنی: نەکرمان

**کرمانج** / kirmanc/: ناو. کرماج؛ کوردمانج؛ کورمانج: ١. کورد؛ ناوێک بۆ گەلی کورد ٢. کوردانی باکوور کە بە زاری کرمانجی باکوور قسە دەکەن ٣. گجە؛ ڕەعیەت (سەرنج: ئەم وشە لە ڕابردوودا بۆ کوردی ڕەشۆکی بەکار چووە) ⚐ ١. ملت کُرد ٢. کُردهای گویشور به گویش کرمانجی شمالی ٣. رعیّت

**کرمانجکی** / kirmanc(i)kî/: ناو. زازاکی؛ دملی؛ شێوەزارێکی زمانی کوردییە لە بڕێ ناوچەی باکووری کوردستان قسەی پێ دەکەن ⚐ زازایی

**کرمانجی**[1] / kirmancî/: ناو. کورمانجی؛ شێوە ئاخافتنی کوردی کرماج ⚐ یکی از شاخەهای اصلی زبان کردی

**کرمانجی**[2]: ئاوەڵناو. کورمانجی؛ سەر بە کرمانج ‹جلوبەرگی کرمانجی› ⚐ کرمانجی

**کرماندن** / kirmandin/: چاوگ. تێپەڕ. //کرماندت؛ دەکرمێنی؛ بکرمێنە// کرمانن؛ داکرۆژین (وەک: بە ددان ورد کردن) ‹هێندێک بادامی کرماند و چوو› ⚐ کلوچیدن (مانند: با دندان خُرد کردن)

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: -/ چاوگی نەرێنی: نەکرماندن

**کرمانن** / kirmanin/: ☜ **کرماندن**

**کرماوی** / kirmawî/: ☜ **کرمەژن**

**کرمتێداو** / kirmtêdaw/: ئاوەڵناو. کرمەژن؛ کارمژن ⚐ کرمو؛ کرمزدە

**کرمتێکەوتو** / kirmtêkewtû/: ئاوەڵناو. کرمەڕێز؛ کرم تێداو (گۆشت) ⚐ کرمو؛ کرمزدە (گوشت)

**کرمخواردو** / kirmx(i)wardû/: ئاوەڵناو. کرماوی؛ کرم تێداو ⚐ کرمخوردە

**کرمزی** / kirm(i)zî/: ناو. تەرجۆ؛ پەرجۆ؛ مەهدەر؛ کاری کەس نەکردوو ⚐ مُعجزە

**کرمژنە** / kirmijne/: ☜ **کرمەژن**

**کرمک** / kirmik/: ئاوەڵناو. کرمۆک؛ ڕەنجبەر؛ زەحمەتکێش ⚐ زحمتکش

**کرمکار** / kirmkar/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* کارا؛ لێهاتوو

■ کارا

**کرمکوژە** / kirmkuje/: ناو. گیانگیر؛ گیایەکی ژەهراوی کە تا یەک میتر بەرز دەبێ، هاوینان لە سەر لقەکانییەوە گوڵی بە کۆمەڵی سپی دەکا ■ جعفری زهری

**کرمکە** / kirm(i)ke/: ناو. ۱. کرمۆکە؛ خشڵێکی ژنانە، لە چەشنی کرمی پاڵپێکەوەدراو دروستکراوە ۲. نەخشێکە لە چیغی چادری دەکەن ■ ۱. از زیورآلات زنانه ۲. نقشی بر چیغ سیاهچادر

**کرمکیز** / kirmkîz/: ناو. ژانەزگ لە کرمەوە ■ شکمدرد ناشی از کرم

**کرمن** / kirmin/: ناوەڵناو. ۱. ☜ کرمەژن ۲. چاوچنۆک؛ بەغیل ■ ۱. ☜ کرمەژن ۲. حسود

**کرمنای** / kirmnay/: چاوگ. کرماندن ■ کلوجیدن

**کرموزی** / kirmuzî/: ناو. مز و تەمی زۆر ■ مه غلیظ

**کرموژن** / kirmujin/: ☜ کرمەژن

**کرمۆژە** / kirmoje/: ناو. کار و ڕەوتی وردە ـ وردە خواردن ■ عمل کم ـ کم خوردن

**کرمۆس** / kirmos/: ناوەڵکار. لەپڕ؛ لەنکاو ■ ناگهانی

**کرمۆک** / kirmok/: ☜ کرمك

**کرمۆکە** / kirmoke/: ناو. ۱. کرمکە؛ خشڵێکی ژنانە ۲. کرمی چکۆلە ■ ۱. از زیورآلات زنانه ۲. کرم ریز

**کرمۆڵ** / kirmoł/: ☜ کرمەژن

**کرمۆڵیای** / kirmołyay/: چاوگ. کرمۆڵ بوون ■ کرمو شدن

**کرمە**[1] / kirme/: ناو. داروو‌کەیەکە لە ئامووردا ■ چوبکی در خیش

**کرمە**[2]: دەنگەناو. کرم؛ دەنگی داکرۆژتن ■ کرچ؛ صدای کلوجیدن

**کرمەپانە** / kirmepane/: ناو. زووری؛ موومار؛ مۆلک؛ کرمی کدوو ■ کرم کدو

**کرمەتووکنە** / kirmetûkne/: ناو. دەروێشەمارە؛ جۆرێک کرمی تووکنی وردە، بە تۆپەڵ لە گیایەک دەهاڵێ و تۆڕێکی وەک جۆلاتەنە بە سەر خۆیدا دەکێشێ ■ نوعی کرم کُرکدار

**کرمەتەنبەڵە** / kirmetenbełe/: ناو. شەوڕەو؛ کرمێکی ڕەشە بە شەو لە بڕکەی بێستان وەخۆ دەکەوێ و بە ڕۆژدا لە بن خۆڵ خۆی مات دەدا ■ کرم آفت جالیز

**کرمەچۆڵێ** / kirmeçołê/: ☜ کرۆژنە

**کرمەڕێز** / kirmeřêz/: ناوەڵناو. کرمتێکەوتوو؛ کرم تێداو (گۆشت) ‹لاشەکەی کرمەڕێز ببوو› ■ کرمو؛ کرمزده (گوشت)

**کرمەژن** / kirmej(i)n/: ناوەڵناو. کارمژن؛ کرماوی؛ کرمژنە؛ کرمن؛ کرموژن؛ کرمۆڵ؛ کرمەژنە؛ کرمەژەن؛ کرمەژەنە؛ کرمی؛ کرمێ؛ کورمژ؛ کەرمژین؛ کەرمک؛ کرمتێداو ■ کرمو؛ کرمزده

**کرمەژنە** / kirmej(i)ne/: ☜ کرمەژن

**کرمەژەن** / kirmejen/: ☜ کرمەژن

**کرمەژەنە** / kirmejene/: ☜ کرمەژن

**کرمەسوورکە** / kirmesûrke/: ☜ کرمەسوورە

**کرمەسوورە** / kirmesûre/: ناو. کرمەسوورکە؛ کرمێکە لە بن خاکی شەداردا دەژی و بۆ دەرمان دەشێ ■ خراتین؛ کرم خاکی

**کرمەک** / kirmek/: ناو. ۱. کرمکە؛ کرمک؛ خشڵی ژنانە ‹ڕێکتر لە گەڕی ڕەشبەڵەک/ خۆشتر لە خرمژنی کرمەک «هێمن»› ۲. زوانەی ناو ئاڵقە ۳. کرمێکی چکۆلەی سپیڕەنگە مێوینەکەی لە ڕیخۆڵەگەورەی مرۆ، بەتایبەت منداڵدا دادەمەزرێ ■ ۱. از زیورآلات زنانه ۲. زبانه ۳. کرمک

**کرمەکرم** / kirmekirm/: دەنگەناو. خرمەخرم؛

کرتەکرت؛ دەنگی داکرمینی شتی ڕەق و تـورت ☰ کرچ ـ کرچ

**کرمی** / kirmî/: ☜ **کرمەژن**

**کرمیای** / kirmyay/: چاوگ. کرمان ☰ خُرد شدن با دندان

**کرمیت** / kirmît/: نـاو. کبریـت؛ کربیـت؛ کرویـت؛ کفتـک؛ کفریـت؛ کوفتیـک؛ کوفریـت؛ شـەمچە؛ شخاتە؛ شقارتە؛ شقاڵتە ☰ کبریت

**کرمێ** / kirmê/: ☜ **کرمەژن**

**کرمێن** / kirmên/: نـاو. تیرێـن؛ جۆرێـک کایـەی منداڵانە بە هەڵمات دەکرێ ☰ نوعی تیلەبازی

**کرن** / k(i)rin/: ☜ **کردن**

**کرنـاس** / kirnas/: ئاوەڵـناو. کـرناس؛ ئـاوڵاوی؛ هاوڵەڕوو ☰ أبلەگون

**کرنگ** / k(i)ring/: نـاو. زۆم؛ ئۆبـە؛ هۆبـە ☰ گـروە چادرنشینان دور هم در ییلاق

**کرنوو** / kirnû/: ☜ **گەرچەك**

**کرنی** / kirnî/: ☜ **گەرچەك**

**کرواس** / kirwas/: نـاو. ١. جـاوگ؛ جـاو؛ جانـگ؛ پشۆرە؛ پارچەی بەنی درشتچن و زبر کە زۆرتـر بە دەسگای دەستی دەچنرێ ٢. ☜ **کراس ـ١** ☰ ١. کرباس ٢. ☜ **کراس-١**

**کروژتن** / k(i)rujtin/: ☜ **کورۆژتن**

**کروشمە** / k(i)ruşme/: ☜ **کرووشمە**

**کروشمەکردوو** / k(i)ruşmekirdû/: ئاوەڵناو. گـورپ؛ مات ☰ کز کردە و مات

**کروڤە** / k(i)ruve/: ☜ **کرێوە**

**کروک** / k(i)ruk/: ناو. وەردێنک؛ ناوەند ☰ مرکز

**کروکودیل** / k(i)rukudîl/: ☜ **تیمساح**

**کرویت** / kirwît/: ☜ **کرمیت**

**کروێ** / kirwê/: ناو. گرێی هەڵتۆقیو لە دارا ☰ گرە تنەی درخت

**کرۆپ** / k(i)rop/: ناو. کرۆک؛ لەش ☰ کالبد

**کرۆت** / k(i)rot/: ناو. جۆرێ هەمرۆ ☰ نوعی گلابی

**کرۆتان** / k(i)rotan/: ☜ **کورۆژتن**

**کرۆتانن** / k(i)rotanin/: ☜ **کورۆژتن**

**کرۆتن** / k(i)rotin/: ☜ **کورۆژتن**

**کرۆتیان** / k(i)rotyan/: ☜ **کورۆژیان**

**کرۆتیانن** / k(i)rotyanin/: ☜ **کورۆژیان**

**کرۆچاندن** / k(i)roçandin/: ☜ **کورۆژتن**

**کرۆچانن** / k(i)roçanin/: ☜ **کورۆژتن**

**کرۆچنای** / k(i)roçnay/: ☜ **کوروژاندن**

**کرۆچەنە** / k(i)roçene/: ☜ **کرۆژنە**

**کرۆچیان** / k(i)roç(i)yan/: ☜ **کورۆژیان**

**کرۆزروو** / k(i)roz(i)rû/: نـاو. گیایەکـە ☰ گیـاهی است

**کرۆژ** / k(i)roj/: ناو. کەلۆت ☰ کلوچ

**کـرۆژان** / k(i)rojan/: چـــاوگ. کورســـــین؛ کورۆژیانەوە ☰ کلوچیدن

**کرۆژتن** / k(i)rojtin/: ☜ **کورۆژتن**

**کرۆژران** / k(i)rojran/: ☜ **کورۆژیان**

**کرۆژنە** / k(i)rojne/: ناو. کرتک؛ کرتە؛ کرکرتۆکە؛ کرکرۆکـە؛ کرکرۆکـە؛ کرمەچۆڵـێ؛ کرۆچەنـە؛ کـرۆژە؛ کـرۆژەک؛ کرۆژەڵـە؛ کرێچنـە؛ کرکـرە؛ کرکراکە؛ کرکراگە؛ کرکرانە؛ کرکـرگ؛ کرکـرک؛ کرکـروک؛ کورکـورۆژە؛ کـەرکریک؛ چەشـنێک شانەی پێوەندی، نەرمترە لە ئێسک و سەرچاوەی شانەی ئێسکە ☰ غضروف

**کرۆژە** / k(i)roje/: ☜ **کرۆژنە**

**کرۆژەک** / k(i)rojek/: ☜ **کرۆژنە**

**کرۆژەڵە** / k(i)rojełe/: ☜ **کرۆژنە**

**کرۆژین** / k(i)rojîn/: ☜ **کورۆژتن**

**کرۆسانەوە** / k(i)rosanewe/: ☜ **کورۆژیان**

**کرۆستن** / k(i)rostin/: ☜ **کورۆژتن**

**کرۆستنەوە** / k(i)rost(i)newe/: ☜ **کورۆژتن**

**کرۆسرانەوە** / k(i)rosranewe/: ☜ **کورۆژیان**

**کرۆسک** / k(i)rosik/: ناو. ١. کرۆکس؛ کورسک؛ کورۆسک؛ گرسک؛ گرۆسک؛ گیرسک؛ هەرمێ کێویلە ٢. تیخەڵەی کڕووز ☰ ١. گلابی وحشی ٢. تیغ زنگارزده

**کرۆشتن** / k(i)roştin/: ☜ **کورۆژتن**

**کرۆشە** / k(i)roşe/: ناو. قولاو؛ نیشانەیەک بە وێنەی دوو خەتی ڕاستی سەر چەماوە: [ ] کە: ١. *[ربازی]* بۆ تێخستنی چەند کەوان ٢. بۆ زیاد کردنی وشە یان چەمکێک بە دەقی نووسراوە ٣. لە پەرتووکێکی وەرگێڕاودا، بۆ جێگای ئەوی وەرگێڕ لێی زیاد دەکا ☰ ١تا٣. کروشە

**کرۆک** / k(i)rok/: ناو. ١. *[ریزمان]* کرکار؛ بکەرد؛ کەس یان شتێ کە کارێک دەکا یان کردارێکی وەپاڵ دەنرێ ٢. ☜ **کرۆپ** ٣. پەرچەم؛ ئەندامی نێرینەی گوڵ ☰ ١. فاعل یا مُسندالیه ٢. ☜ **کرۆپ** ٣. پرچم گُل

**کرۆکس** / k(i)rok(i)s/: ☜ **کرۆسك ـ١**

**کرۆڵ** / k(i)roł/: ☜ **کلۆڵ**

**کرۆڵیای** / k(i)rołyay/: چاوگ. لە سەرمادا تەزین ☰ کرخت شدن از سرما

**کرۆموزوم** / k(i)romuzum/: ناو. تاڵئاسای ناو ناوکی سیللولی گیانداران کە تایبەتمەندییە کەلەپوورییەکانی پێیە ☰ کروموزوم

**کرۆن** / k(i)ron/: ناو. یەکەی پارەی ولاتانی سوئید، نورڤیژ و دانمارک ☰ کرون

**کرووتاندن** / k(i)rûtandin/: ☜ **کرتاندن**

**کرووچ** / k(i)rûç/: ناوەڵناو. ١. لێوشکاو ٢. سواوی کۆن ☰ ١. لب‌پر ٢. فرسوده

**کروور**[١] / k(i)rûr/: ناو. کورروور؛ کولور؛ پێنسەدهەزار ☰ کُرور

**کروور**[٢]: ناوەڵناو. ١. کورروور؛ کولور؛ بە چەندیەتی یان هەندی پێنسەدهەزارەوە ٢. کلۆر؛ ناوخاڵی ☰ ١. کرور ٢. توخالی

**کرووز** / k(i)rûz/: ناو. ڕەوتی ناوەڕۆک کۆڵین؛ ناو هێنانە دەر لە قاپێلک ☰ عمل مغزدانه بیرون آوردن

**کرووساندنەوە** / k(i)rûsand(i)newe/: ☜ **کورۆژتن**

**کرووستنەوە** / k(i)rust(i)newe/: ☜ **کورۆژتن**

**کرووسرانەوە** / k(i)rûsranewe/: ☜ **کورۆژیان**

**کرووسیانەوە** / k(i)rûsyanewe/: ☜ **کورۆژیان**

**کرووشمە** / k(i)rûşme/: ناو. کورشمە؛ کروشمە؛ کوریشکە؛ کۆشکە؛ کاری خۆ کز کردن و مات دانیشتن ☰ عمل کز کردن و در گوشه‌ای نشستن

**کرەکاڵ** / k(i)rekal/: ناوەڵناو. تایبەتمەندی زەوییەک کە هەموو ساڵێک دەکێڵدرێ ☰ ویژگی زمینی که هر سال کشت می‌شود

**کرها** / kirha/: ناو. کرێ؛ کراها ☰ کرایه

**کری** / k(i)rî/: ☜ **کرێ**

**کریان** / kiryan/: ☜ **کران**

**کریانەوە** / kiryanewe/: ☜ **کرانەوە**

**کریای** / kiryay/: چاوگ. کران ☰ انجام شدن

**کریایۆ** / kiyayo/: چاوگ. کرانەوە ☰ باز شدن

**کریبار** / k(i)rîbar/: ☜ **کرێبار**

**کریپتون** / k(i)rîptun/: ناو. توخمی کیمیاوی لە دەستەی گازە نەجیبەکان، بە ژمارەی ئەتومی ٣٦ و کێشی ئەتومی ٨٣،٨٠ بێڕەنگ، بێبار کە لە هەوادا هەیە و لە لامپی ئیلکتریکیدا بەکار دێ ☰ کریپتُن

**کریتی** / k(i)rîtî/: ناو. کەدوو؛ کدوو ☰ کدو

**کریزەنتێن** / k(i)rîzentên/: ناو. پات؛ گوڵێکی دەشتی زۆر خوشیکە ☰ گلی زیبا

**کریژۆک** / k(i)rîjok/: ناو. کریژیۆک؛ تەپڵی گوێ؛ پەردەی گوێ؛ پەڕەی گوێ ☰ پردەی صُماخ

**کریژیۆک** / k(i)rîjyok/: ☜ **کریژۆك**

**کریس**[١] / k(i)rîs/: ☜ **کریسك**

**کریس**[٢]: ناوەڵناو. زوانچەور؛ مەرایی‌کەر ☰ چاپلوس

**کریس**[٢]: دەنگ. وشەی بانگ لێ کردنی کارژۆلە ☰ کلمەی خواندن بُزغالە

**کریستاڵ / k(i)rîstał/**: ناو. بلوور؛ بلۆر ☰ کریستال

**کریستیان / k(i)rîst(i)yan/**: ئاوەڵناو. عیسایی؛ فەلە؛ مەسیحی ☰ مسیحی

**کریسک / k(i)rîsk/**: ناو. کریس؛ کریسکە؛ پزیسکی ئاگر ☰ شرارە

**کریسکە / k(i)rîske/**: ☜ **کریسك**

**کریسمەس / k(i)rîsmes/**: ناو. جێژنی مەسیحییان، لە ڕۆژی ٢٥ی دیسامبر (لە نێو ڕۆژهەلاتییان ٧ی ژانویە) بە بۆنەی لە دایک بوونی عیسا مەسیح ☰ کریسمس

**کریسە / k(i)rîse/**: ناو. کاری ماستاو کردن ☰ چاپلوسی

**کریفۆک / k(i)rîfok/**: ناو. کوریفۆک؛ کەریفۆک؛ شەمەتریلکە ☰ زنبورعسل وحشی

**کریڤ / k(i)rîv/**: ☜ **کریڤ**

**کریکێت / k(i)rîkêt/**: ناو. گەمەیەکی بە کۆمەڵ لە نێوان دوو گرۆ بە تۆپ و ڕاکێتەوە ☰ کریکت

**کرینچک / k(i)rînçik/**: ناو. قشت؛ پەرچووکەی لە سەر هەنی قرتاو ☰ کاکُل بر پیشانی قیچی شده

**کریو / k(i)rîw/**: ☜ **کریڤ**

**کریە / kirye/**: ناو. کرێ؛ بازاڕەڕۆژی یەکشەمە ☰ یکشنبه بازار

**کرێ / k(i)rê/**: ناو. کری: ١. حەقی کار ٢. کرا؛ ئیجارە ٣. ☜ **کریە** ☰ ١. مُزد ٢. کرایە؛ اجارە ٣. کریە

⊡ **کرێ دان**: کرها دان؛ کرایە دان؛ شتێ یا شوێنێ بە ئیجارە دان ☰ اجارە دادن

**کرێ گرتن**: کەڵک گرتن لە شتێ یا شوێنێ لە بەرامبەر پارە دان بە خاوەنەکەیەوە ☰ اجارە کردن

**کرێب**[١] **/ k(i)rêb/**: ناو. خەم و خەفەت ☰ اندوە

**کرێب**[٢]: ئاوەڵناو. ١. تایبەتمەندی زەوینێ کە دوو ساڵ جارێ دەکێڵدرێ ٢. یەک جار گاسن لێ دراو ☰ ١. ویژگی زمینی کە دو سال یک بار کشت شود ٢. یک بار شخم شدە

**کرێبا / k(i)rêba/**: ناو. ١. جیرانە زەوی ٢. هاوماڵی دێ ☰ ١. همسایە در کشاورزی ٢. همروستایی

**کرێبار / k(i)rêbar/**: ناو. کریبار؛ حەقی بار بۆ هەڵگرتن ☰ کرایەی حمل بار

**کرێت**[١] **/ k(i)rêt/**: ناو. سندەگڵ ☰ کلوخ

**کرێت**[٢]: ئاوەڵناو. ١. ناشیرین؛ بێبەش لە جوانی ٢. پیس و خراپ ☰ ١. کریە؛ زشت ٢. بد

**کرێچ / k(i)rêç/**: ناو. سواڵەت؛ قوڕی سوورەوەکراو ☰ سُفال

**کرێچنە / k(i)rêçne/**: ☜ **کرۆژنە**

**کرێچی / k(i)rêçî/**: ناو. ١. دەفری سواڵەت ٢. کرێنشین؛ کرانشین ☰ ١. سُفالین ٢. کرایەنشین

**کرێدار / k(i)rêdar/**: ☜ **کرانشین**

**کرێداسی / k(i)rêdasî/**: ناو. هەقە پاڵە؛ مزی دروێنە ☰ مُزد درو

**کرێژ / k(i)rêj/**: ناو. قرێژەبەرد؛ کرێژ؛ کرێش ☰ گُلسنگ

**کرێژەبەرد / k(i)rêjeberd/**: ☜ **کرێژەبەرد**

**کرێش / k(i)rêş/**: ☜ **کرێژ**

**کرێشتەیش / k(i)rêşteyş/**: چاوگ. دەرکێشان؛ کێشانە دەرەوە ☰ آختن؛ آهیختن

**کرێشە / k(i)rêşe/**: ناو. چەشنێ پارچەی بەنی سووک کە زیاتر بۆ کراسی ژنانە بە کاری دەبەن ☰ کریشە

**کرێشەیش / k(i)rêşeyiş/**: چاوگ. ١. ڕاکێشان بە زەمیندا ٢. دەرکێشان؛ کێشانە دەر ٣. گواستنەوە؛ گوێزانەوە ٤. نرخاندن؛ سەنگاندن ☰ ١. بر زمین کشیدن ٢. بیرون کشیدن ٣. نقل مکان

کردن ۴. ارزیابی کردن

**کریڤ** / k(i)rêv/: ناو. کریو؛ کریف: ۱. خزم؛ قەوم ۲. هەوال؛ دۆست ۳. کەسێ کە منالّ لە باوەشیا خەتەنە کراوە ☰ ۱. خویش ۲. دوست ۳. کسی کە کودک را در بغلش ختنە کردەاند

**کریڤە** / k(i)rêve/: ☜ **کرێوە**

**کریکار** / k(i)rêkar/: ☜ **کارگەر**

**کریکاری** / k(i)rêkarî/: ☜ **کارگەری**

**کریکی** / k(i)rêkî/: ناو. جاش و جانووی دووبڕ ☰ کُرەی دو بهارە

**کریگرتە**[۱] / k(i)rêgirte/: ناو. ۱. کرانشین ۲. خانوویێ کە بە کرێ دەدرێ ☰ ۱. اجارەنشین ۲. خانەی اجارەای

**کریگرتە**[۲]: ئاوەڵناو. کرێ‌گیراو ☰ اجارەشدە

**کریگرتی** / k(i)rêgirtî/: ☜ **کرانشین**

**کریل**[۱] / k(i)rêł/: ناو. کلیل؛ کلێل؛ هاچەر ☰ کلید

**کریل**[۲]: ئاوەڵناو. ۱. گوێ‌کپ ۲. کڕال؛ قاقڕ ☰ ۱. ناشنوا ۲. بی‌گیاه

**کریم** / k(i)rêm/: ناو. تێکەڵاوێک لە چەن ماک بە شێوەی هەویر کە بۆ دەرمان و جوانی لە پێستی هەڵدەسوون ☰ کِرِم

**کرێنشین** / k(i)rênş(i)în/: ☜ **کرانشین**

**کریهانشین** / k(i)rêhan(i)şîn/: ☜ **کرانشین**

**کڕ**[۱] / kiř/: ناو. ۱. فرێت؛ پەت؛ سێتا ۲. هەورازی ڕژد و کووڕ ۳. تیشەشاخ؛ تیشە بەردی کێو ٤. خەت؛ شوێنی قەڵەم بە سەر ڕووپەڕدا ٥. ساو ‹بچۆ تاوێ دانیشە و کرێ بە لە داسەکەت!› ٦. کر؛ دەسکرد ۷. کر؛ چندراو؛ تەنیاگ ☰ ۱. ریسمان ۲. کوە مرتفع و دشوارگُذر ۳. صخرە ۴. خط ۵. ساب ۶ ساختە شدە ۷. تنیدە؛ بافتە شدە

◘ **کڕی هەڕێ**: جاش؛ بەچکەکەر؛ هۆلیکەر؛ دەحشک ☰ کُرّەخر

◘ **کڕ لێ دان**: ۱. ساو دان؛ تیژ کردن ۲. *[پەلار]* واژۆ کردن ☰ ۱. ساب زدن ۲. امضا کردن

**کڕ**[۲]: ئاوەڵناو. ۱. هێور؛ ئارام ‹دنیایەکی کڕە› ۲. کپ؛ بێدەنگ ‹کوتم: وەفا، شەو کڕ و کەڕە و نیوەنووزەی تۆ بە گوێیا ناچێ «سوارە»› ۳. لە سەر هێلکە خەوتوو (مریشک) ٤. پندر؛ پنر؛ توند ☰ ۱. آرام ۲. خاموش ۳. کُرچ ۴. سِفت؛ نیم خشک

◘ **کڕ بوون**: ۱. ئارام بوون ۲. بێدەنگ بوون ‹چی ما نەیکەم؟/ پێیان وتم: شین بە! شین بووم/ زەرد بە! زەرد بووم/ .../ بقیڕێنە، قیڕ، قیڕاندم، کڕ بە! کڕ بووم «پەشێو»› ۳. وە کڕ کەوتن؛ لە سەر هێلکە دانیشتنی مریشک ☰ ۱. آرام شدن ۲. خاموش بودن ۳. کُرچ شدن مرغ

**کڕ بوونەوە**: ۱. ئارام بوونەوەی کێشە و هەرا ۲. پندر بوونەوە ☰ ۱. فرونشستن جنجال ۲. سفت و نیم خشک شدن مایع

**کڕ کردن**: ۱. بێدەنگ کردن ۲. خۆ مات دان ۳. توند و بە تیژی بردن ٤. *[مەجاز]* کەسێ کوشتن ☰ ۱. بی‌صدا کردن ۲. کز کردن ۳. سریع و با خشونت بُردن ۴. کسی را کشتن

**کڕ کەفتن**: ☜ **کڕ کەوتن**

**کڕ کەوتن**: کڕ کەفتن؛ وە کڕ کەفتن؛ لە سەر هێلکە خەوتن ☰ کُرچ خوابیدن مُرغ

**وە کڕ بوون**: ۱. لە سەر هێلکە بوون ۲. *[کینایە]* دەرنەکەوتن؛ لە ماڵ خۆ ماتە دان ۳. *[پەلار]* لای ژن جێ نەهێشتن ☰ ۱. کُرچ بودن ۲. در خانە ماندن ۳. از کنار زن جُم نخوردن

▪ **کڕ**[۳]: پاشەوشە. ۱. بسێن ‹جەڵەبکڕ؛ خەمکڕ› ۲. کڕێن ‹بن‌کڕ› ☰ ۱. ـخر؛ خریدار ۲. برکنندە

**کڕاڕ** / k(i)řař/: ☜ **کڕاڵ۔۱**

**کڕاژ** / k(i)řaj/: ناو. ۱. کڕاش؛ شەم؛ شەمێ؛ مێو ۲. کڕاش؛ شۆرەی بن موو ۳. توێژەمار ☰ ۱. موم ۲. شورەی سر ۳. پوست مار

**کڕاش** / k(i)řaş/: ☜ **کڕاژ۔۱و۲**

**کراقالی / k(i)řaqalî/**: ناو. کرەیدی؛ پوختەی بێژە؛ کورتەی وتار ☰ مُختصر کلام

**کراک / k(i)řak/**: ناو. ۱. سورێنچکە؛ قرقراگە ۲. قولی گوێ؛ کونای گوێچکە ☰ ۱. سُرخنای ۲. سوراخ گوش

**کراڵ / k(i)řał/**: ئاوەڵناو. ۱. کراڕ؛ کرێن؛ کرێنک؛ قاقڕ؛ ڕووتەن ۲. تەنک (دەغڵ) ☰ ۱. لم‌یزرع (زمین) ۲. کم‌پُشت (کشتزار غله)

**کران / k(i)řan/**: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //کرای؛ دەکرێی؛ بکرێ// کریان؛ کردران؛ کریای: ۱. ڕنیان ۲. سەنیان؛ سنیان ☰ ۱. برکنده شدن ۲. خریداری شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: کراو/ چاوگی نەرێنی: نەکران

**کرانت / k(i)řant/**: ناو. کورادە؛ گیایەکی تام تیژە لە تەرەپیاز دەکا ☰ گیاهی است

**کرانتش / k(i)řantiş/**: چاوگ. کرۆنتش؛ کرونتش: ۱. ڕاکێشان بە زەویدا ۲. کێشان بە تەرازوو ۳. دەرکێشان ٤. خۆ هەڵکراندن لە بەر خورانی لەش ☰ ۱. بر زمین کشیدن ۲. توزین کردن ۳. بیرون کشیدن ۴. خود را خاراندن

**کراندن / k(i)řandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //کراندت؛ دەکرێنی؛ بکرێنە// کرانن: ۱. ڕنین ۲. لە بنەوە ساوین ۳. هەوڵ دان؛ تەقالا دان (زۆرتر لەگەڵ «کردن»دا دێ) ‹تەنبوورێکیان هێنا، ئاغا حەولی دا فێرم کا، بەڵام هەرچی کردی و کراندی نەمتوانی قامکی هەر دووک دەستم وێکڕا کار بکا! ناچار وازم لێ هێنا و زۆرم زگ بە نازیرەکی خۆم سووتا! «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ ۱. حک کردن ۲. سِفت مالیدن ۳. کوشیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەکراندن

**کراندنەوە / k(i)řand(i)newe/**: چاوگ. کراننەوە: ۱. بە ددان ڕووت کردنەوە ‹ئەوەندە برسی بوو ئێسکەکەشی کراندەوە› ۲. کراندن؛ کرانن ۳. [مەجاز] تەواو لە ناو بردنی لەوەڕ ‹نسارەکەیان تەواو کراندەوە› ٤. [کینایە] خستنە سەر ساجی عەلی؛ هیچ بۆ نەهێشتن ‹زانستگای ئازاد کراندمیەوە!› ☰ ۱. به دندان کشیدن ۲. حک کردن ۳. لُخت کردن چراگاه ۴. از هستی ساقط کردن

**کرانن / k(i)řanin/**: ☜ کراندن

**کراننەوە / k(i)řannewe/**: ☜ کراندنەوە

**کرانەوە / k(i)řanewe/**: چاوگ. ۱. کزانەوە و سەرما بوونی قوڕگ ۲. بە ددان ڕووت بوونەوە ☰ ۱. احساس سوزش کردن در گلو از سرماخوردگی ۲. لخت شدن چیزی با دندان

**کراو / k(i)řaw/**: ئاوەڵناو. ۱. سەنیاگ ۲. ڕندراو ☰ ۱. خریداری شده ۲. حک شده

**کراوە / k(i)řawe/**: ئاوەڵناو. ڕندراو ☰ حک شده

**کرخەو[1] / kiřxew/**: ناو. خەوی قورس ☰ خواب سنگین

**کرخەو[2]**: ئاوەڵناو. خەوی قورس‌لێ‌کەوتوو ☰ غرقِ‌خواب

**کردران / kiřd(i)ran/**: چاوگ. کران؛ کریان: ۱. ڕنیان ۲. سەنیان؛ سنیان ☰ ۱. برکنده شدن ۲. خریداری شدن

**کرش / kiřş/**: ناو. ۱. شیشی پۆ تێخستن و کوتان لە تەوندا ۲. کار و ڕەوتی ڕاگوێزانی شت ☰ ۱. از ابزار بافندگی ۲. نقل و انتقال اشیاء

**کرشتش / kiřştiş/**: چاوگ. ۱. ماڵ گوازتنەوە ۲. ئەسپاب ڕاگوێزان ☰ ۱. نقل‌مکان کردن ۲. جابه‌جا کردن وسایل

**کرک / kiřk/**: ئاوەڵناو. ۱. ئاڵۆز؛ هەڤدەل؛ بێ‌سەرەوبەرە ۲. کڕ؛ کرە؛ قەپک ☰ ۱. آشفته ۲. کُرچ

**کرکاش / kiřkaş/**: ☜ کروکاش

**کرکاشە / kiřkaşe/**: ☜ کروکاش

**کرکاك / kiřkak/**: ناو. باڵدارێکە ☰ پرنده‌ای است

**کرکر / kiřkiř**/: ئاوەڵناو. میل ـ میل؛ ڕاـ ڕا؛ ڕێ ـ ڕێ ☰ راه ـ راه

**کرکراکە / kiřk(i)řake**/: ☜ **کرۆژنە**

**کرکراگە / kiřk(i)řage**/: ناو. ١. سووڕێنچکە ٢. کونی گوێ ٣. ☜ **کرۆژنە** ☰ ١. سرخنای ٢. سوراخ گوش ٣. ☜ **کرۆژنە**

**کرکرانە / kiřk(i)řane**/: ☜ **کرۆژنە**

**کرکرک / kiřk(i)řik**/: ☜ **کرۆژنە**

**کرکرگ / kiřk(i)řig**/: ☜ **کرۆژنە**

**کرکـرۆک / kiřk(i)řok**/: ناو. ١. گیایەکە وەک کەلەم دەچێ ٢. سێوەبنعەرزیلە ☰ ١. گیاهی شبیه کلم ٢. سیب‌زمینی استانبولی

**کرکرۆکە / kiřk(i)řoke**/: ☜ **کرۆژنە**

**کرکرە / kiřk(i)ře**/: ناو. ١. ☜ **کرۆژنە** ٢. قرقرە؛ غەرغەرە ٣. دەرابە ٤. جۆرێ ترێ سپیلکە ☰ ١. ☜ **کرۆژنە** ٢. قرقرەی نخ‌پیچ ٣. کرکرە ٤. نوعی انگور سفید

**کرکرەمزێ / kiřk(i)řem(i)zê**/: ناو. بنکڕ؛ بنکڕکە ☰ تەدیگ

**کرکەش / kiřkeş**/: ناو. زاغوور؛ مەستەرە؛ هێڵینگ ☰ خط‌کش

**کرکەفتە / kiřkefte**/: ☜ **کرکەوتو**

**کرکەوتــــو / kiřkewtû**/: ئاوەڵناو. کرکەفتــە؛ کرکەوتە؛ لە سەر هێلکان خەوتوو ☰ کُرچ خوابیده

**کرکەوتە / kiřkewte**/: ☜ **کرکەوتو**

**کرمچین / kiřm(i)çîn**/: ☜ **کەرمەژین**

**کرمشین / kiřm(i)şîn**/: ☜ **کەرمەژین**

**کرناس / kiřnas**/: ☜ **کرناس**

**کرنـای / kiřnay**/: چاوگ. کرانـدن ☰ زدودن یا خراش دادن بر سطح چیزی

**کرنـگ / kiřing**/: ناو. ١. ☜ **کرنـو** ٢. گیـای گەرچەک ☰ ١. ☜ **کرنو** ٢. گیاه کرچک

**کرنۆش / kiřnoş**/: ☜ **کرنوش**

**کرنو / kiřnû**/: ناو. کرنگ؛ کرنی؛ کوڕنوو؛ قرنوو؛ مێروویەکی پانکەڵەی سوورە بە ئاژەڵەوە دەنووسێ ☰ قراد

**کرنوش / kiřnûş**/: ناو. کرنۆش؛ کوڕنووش؛ کوڕنۆ؛ کوڕنوو؛ پانتە؛ سەرکۆپ؛ کاری داهاتنەوە و سەر دانەواندن بۆ ڕێزگرتن ☰ کُرنش

⊡ **کرنوش بردن**: داهاتنەوە و سەر دانەواندن بۆ ڕێزگرتن. هەروەها: **کرنووش کردن** ☰ تعظیم/ کُرنش کردن

**کرنوک / kiřnûk**/: ☜ **گەرچەك**[1]

**کرنە / kiřne**/: ناو. بنکڕ؛ بنکڕنەک ☰ تەدیگ

**کرنی / kiřnî**/: ☜ **کرنو**

**کرنیای / kiřniyay**/: چاوگ. کران ☰ زدوده شدن

**کروکاس / kiř û kas**/: ئاوەڵناو. گێژ و بێدەنگ ☰ گیج و ساکت

**کروکاش / kiř û kaş**/: ناو. کرکاش؛ کرکاشە: ١. کۆکەند؛ کار و ڕەوتی کۆ کردنەوەی گیا و ئالف لەملاولا ‹هەمیسان کەوتە تەلاش و کروکاش/ پێکی هێنا بەشی خۆی پووش و پەلاش «حەقیقی»› ٢. مڵ‌ومۆ؛ گەڕان بۆ دۆزینەوەی شتێک ‹لە هەر عیلمێکا کروکاش ئەکەن/ تا بە کائینات خاستر پەی بوەن «حەقشناس»› ☰ ١. جمع‌آوری و چیدن علف ٢. جستجو

**کرومات / kiř û mat**/: ئاوەڵناو. بێدەنگ و ماق ☰ گیج و منگ

**کرونتش / k(i)řuntiş**/: ☜ **کرانتش**

**کرۆژنە / k(i)řojne**/: ناو. خرتە؛ کرۆژە ☰ غضروف

**کرۆساندنەوە / k(i)řosand(i)newe**/: ☜ **کرووساندنەوە**

**کرۆسینەوە / k(i)řosînewe**/: ☜ **کرووساندنەوە**

**کرۆنتش / k(i)řontiş**/: ☜ **کرانتش**

**کروو / k(i)řû**/: ناو. کۆچەر؛ ڕەوەندە ☰ کوچنده

**کرووز[1] / k(i)řûz**/: ناو. کرووزە؛ کوڕووز: ١. ڕەوتی

سووتانی پێشە و مـوو ‹بـۆ کـرووز› ۲. ڕەوتی پاڕانەوەی زەلیلانە ‹هێندە کرووزاوە زگم پێ سووتا› ▆ ۱. فرایند سوختن استخوان و مو ۲. لابە

**کرووز**[۲]: ئاوەڵناو. کرووزە؛ کورووز: ۱. ساویاوی کۆن ‹کێلی گۆڕی شەهیدی گومناوم/ تاکە داری کرووزی بێئاوم «هێمن»› ۲. ئاولاوی؛ ڕووزە؛ هاوڵـەڕوو ۳. زورهان؛ پیری پەک‌کەوتە ▆ ۱. فرسودە؛ کهنـە ۲. آبلەگون ۳. پیر از کار افتادە

**کرووز**[۳]: دەنگەناو. کرووزە؛ دەنگی گریانی لەسەرخۆ ▆ صدای مویە

**کـرووزان** / k(i)řûzan/: چـاوگ. کلـوزیای: ۱. سووتانی ئێسک و مـوو ۲. پاڕانـەوەی بـە نیـوە گریانـەوە ۳. تووزیانـەوەی پێسـت ▆ ۱. سـوختن اسـتخوان و مـو ۲. لابـە و زاری کـردن ۳. سـوزش داشتن پوست

**کرووزانـدن** / k(i)řûzandin/: چـاوگ. تێپەڕ. //کرووزاندت؛ دەکرووزێنی؛ بکرووزێنە// کلـووزنای: ۱. کرووزانن؛ سووتاندنی ئێسک و موو ۲. *[کینایە]* لە ناو بردن ▆ ۱. سوزاندن استخوان و مـو ۲. نـابود کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەکرووزاندن

**کرووزانن** / k(i)řûzanin/: ☜ **کرووزاندن ـ۱**

**کرووزانـەوە** / k(i)řûzanewe/: چـاوگ. تێنەپـەڕ. //کرووزایـەوە؛ دەکرووزێیـەوە؛ بکـرووزێوە// کرووزیانەوە؛ کولووزیانەوە؛ کوڵوزیانەوە؛ کۆڕانەوە: ۱. پاڕانەوەی زەلیلانە ‹کرووزانەوە دادی نادات› ۲. تووزانەوە؛ چووزانـەوە ▆ ۱. لابـە و زاری کـردن ۲. سوزش داشتن پوست

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: کرووزاوەوە/ چـاوگی نـەرێنی: نەکرووزانەوە

**کرووزنای** / k(i)řûznay/: ☜ **کرووزاندن**

**کرووزە** / k(i)řûze/: ☜ **کرووز**

**کرووزەکرووز** / k(i)řûzek(i)řûz/: ناو. کـرووزی زۆر ▆ لابە و زاری پیاپی

**کرووزیانەوە** / k(i)řûzyanewe/: ☜ **کرووزانەوە**

**کرووزیایۆ** / k(i)řûzyayo/: چاوگ. کرووزانـەوە ▆ لابە و زاری کردن

**کرووژتن** / k(i)řûjtin/: ☜ **کرووساندنەوە**

**کرووس** / k(i)řûs/: نـاو. کـاری کریانـەوە؛ ڕووتـەوە بوون بە ددان ▆ لُخت شدگی چیزی مانند استخوان یا درخت با دندان

**کرووسان** / k(i)řûsan/: ☜ **کرووسانەوە**

**کرووساندن** / k(i)řûsandin/: ☜ **کرووساندنەوە**

**کرووساندنەوە** / k(i)řûsand(i)newe/: چاوگ. تێپەڕ. //کرووساندتەوە؛ دەکرووسێنیەوە؛ بکرووسێنەوە// کرۆسێنەوە؛ کرووساندن؛ کرۆساندنەوە؛ کرووسێنەوە؛ کدووساندنەوە؛ کـرووژتن؛ کرووشتن؛ کراندنەوە بە ددان ▆ بە دندان کشیدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: ـ/ چـاوگی نـەرێنی: نەکرووساندنەوە

**کرووسـانەوە** / k(i)řûsanewe/: چـاوگ. تێنەپـەڕ. //کرووسایەوە؛ دەکرووسێیەوە؛ بکرووسێوە// کرووان؛ کرووسین؛ کرووسان؛ کرووسیان؛ داڕووتانی شتی وەک ئێسک یـان تـوێخی دار بـە ددان ▆ لخت شدن چیزی مانند استخوان یا پوست درخت با دندان

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: کرووساوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەکرووسانەوە

**کرووساوە** / k(i)řûsawe/: ئاوەڵـناو. ڕووت‌کـراو بـە ددان ▆ لخت شدە با دندان

**کرووسین** / k(i)řûsîn/: ☜ **کرووسانەوە**

**کرووسینەوە** / k(i)řûsînewe/: ☜ **کرووساندنەوە**

**کرووشتن** / k(i)řûştin/: ☜ **کرووساندنەوە**

**کرووان** / k(i)řûwan/: ☜ **کرووسانەوە**

**کرە**[۱] / k(i)ře/: نـاو. ۱. دەسـتاڕ؛ هـارە؛ گێرووسـە؛ ئاشی دەستی ۲. ئاسیاوی چەڵتووک و پەڕش لێ کـردن ۳. *[کینایە]* منـەت؛ چکـی؛ منـەتباری ٤.

سەرقاڵ؛ خەریک بە کار ٥. بژیشکی برینگەر ▆ ١. دستاس ٢. آسیاب ویژەی شالیکوبی ٣. مِنَّت ۴. سرگرم کار ۵. جرّاح

◘ **کڕە کردن**: ١. پەڕش و چەڵتووک لە ئاسیاوی کڕە هاڕین ٢. سپاس کردن ٣. *[کنایە]* منەت کێشان ▆ ١. شالی را در آسیاب ویژه کردن ٢. سپاسگزار بودن ٣. منّت کشیدن

**کڕە²**: دەنگەناو. ١. دەنگی لێک ساویانی بە قەوەتی دوو شتی ڕەق ‹کڕەی ددانی دێت› ٢. دەنگی وەک دەنگی گاسن لە خاکی ڕەقدا ‹گاسن کڕە دەکات› ▆ ١. صدای به هم ساییدن چوب یا استخوان ٢. صدای مانند برخورد گاوآهن با خاک سفت

**کڕەک** / k(i)řek/: ناو. نەجووڵ؛ بێجووڵە؛ بەرانبەری زیندەوەر و ڕووەک ▆ جماد

**کڕەکڕ** / k(i)řekiř/: دەنگەناو. کڕەی زۆر و پەیتاپەیتا ▆ صدای سایش مُحکم و مُتناوب

**کڕەیدی** / k(i)řeydî/: ☜ **کڕاقالی**

**کڕی** / k(i)řî/: ناو. ١. ئارامی؛ هێوری ٢. کپی؛ بێدەنگی ٣. باری کڕ کەوتنی مریشک ▆ ١. آرامش ٢. خاموشی ٣. کُرچی مرغ

**کڕیار¹** / kiřyar/: ناو. سەنیار؛ بسێن؛ پسێن؛ کڕینۆخ؛ ئەوی شت دەکڕێ ‹لێیان گرتبوو گوێسوانە و ڕێباز/ کڕیار گەلێکە بۆ کڕینی ناز «هێمن»› ▆ خریدار

**کڕیار²**: ئاوەڵناو. بسێن؛ سەنیار؛ ئەسان؛ کڕینۆخ؛ بە تامەزرۆیی و هۆگری بۆ سەندنی شتێ ‹بولبول لە گولی گولاوە کڕیار/ تۆش وەک منی دوور لە دلبەر و یار «هەژار، *مەم و زین*»› ▆ طالب؛ خواستار

**کڕیان** / kiřyan/: چاوگ. سێندران؛ سەنیان ▆ خریده شدن

**کڕیانەوە** / kiřyanewe/: چاوگ. ١. دوای فرۆش دیسان کڕیانی فرۆشیاو ٢. ڕووتانەوەی لەوەڕگە ٣. *[کنایە]* کەوتنە سەر ساجی عەلی؛ هیچ بۆ نەمان ‹بەو ژن خواستنەم تەواو کڕیامەوە› ▆ ١. بازخریده شدن ٢. لخت شدن چراگاه ٣. از هستی ساقط شدن

**کڕیای** / kiřyay/: ☜ **کڕان**

**کڕیڤە** / k(i)řîve/: ☜ **کڕیوە**

**کڕین** / k(i)řîn/: چاوگ. تێپەڕ. //کڕیت؛ دەکڕی؛ بکڕە// سەندن؛ سەنن ▆ خریدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەکڕین

**کڕینۆخ** / kiřînox/: ئاوەڵناو. کڕیار؛ بسێن ▆ خریدار

**کڕینەوە** / k(i)řînewe/: چاوگ. ١. لە پاش فرۆش سەندنەوە ‹... ناردبووی ڤۆدکای کڕیبوو، بەڵام نەیدەخواردەوە. لێمان قەرز کرد کە بۆی دەکڕینەوە! «هەژار، *چێشتی مجێور*»› ٢. *[کنایە]* ڕزگار کردن لە چۆرتم ‹ئەشێ بشترسن لەو ڕۆژەی کە ڕۆژی هەرکەس ـ هەرکەسە و کڕینەوە لەو ڕۆژەدا باوی نییە و تکاکاری بەهرە نادا و کەسیش دە هانای کەس نایە «هەژار، *قورئان*»› ▆ ١. بازخریدن ٢. نجات دادن

**کڕیوە** / k(i)řîwe/: ناو. وەللک ▆ کولاک

**کڕێژ** / k(i)řêj/: ناو. کڕێش؛ کڕێش؛ کەڕاژە: ١. شانەی وشکی هەنگوین ٢. قڕێژ؛ شتێ کە بە چنگ لێ دان لە سەری چڵکن و کەچەڵ دادەوەرێ ٣. قەوزەی بەرد ٤. چڵک؛ پیسی ▆ ١. شانەی خشکیدەی عسل ٢. سبوسەی سر ٣. گُلسنگ ۴. چرک؛ کثافت

**کڕێژاو** / k(i)řêjaw/: ☜ **کڕێژاوی**

**کڕێژاوی** / k(i)řêjawî/: ئاوەڵناو. کڕێژاو: ١. سەر بە کڕێژ ٢. پیس؛ چڵکن ▆ ١. گرفتار سبوسەی سر ٢. چرکین

**کڕێژەبەرد** / k(i)řêjeberd/: ناو. کڕێژەبەرد؛ قەوزەی سەر بەرد ▆ گُلسنگ

**کڕێش** / k(i)řêş/: ☜ **کڕێژ**

**کڕێن¹** / k(i)řên/: ناو. تمتمان؛ زەوینی بەردەڵان

☰ زمین سنگی

**کرێن**[٢]: ئاوەڵناو. بەردەڵان؛ ڕەق و بێ گیا ‹ئەو لا نسارە، کرێنە› ☰ سنگلاخی

**کرێنک / k(i)řênik/**: ☜ **کراڵ ـ١**

**کرێوکرێو / k(i)řêwk(i)řêw/**: ناو. باڵدارێکە ☰ پرندەای است

**کرێوە / k(i)řêwe/**: ناو. کروڤە؛ کرێڤە؛ کەروڤە؛ کلافە؛ کەڤێلە؛ بەفر و با پێکەوە ☰ کولاک

⊡ **کرێوە کردن**: ١. بەفر و با پێکەوە هاتن ٢. [مەجاز] زۆر سارد بوون ☰ ١. کولاک کردن ٢. بسیار سرد بودن هوا

**کرێوەبردوو / k(i)řêwebirdû/**: ئاوەڵناو. [مەجاز] بە سەرما قەڵس ☰ سرمایی

**کرێوەپێچ / k(i)řêwepêç/**: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی گیانداریَ کە لە ترسی کرێوە پەنا بۆ هەموو ئەنوایەک دەبا ☰ ویژگی جانوری کە از ترس کولاک بە هر جا پناه می‌برد

**کز**[١] **/ kiz/**: ناو. ١. کزە؛ چۆنیەتی ژانی پێست و برین؛ چووزانەوە؛ سووزیانەوە ٢. کونەمێروولە ٣. شارەمێروولە ٤. کرژ؛ درز؛ کورووژمە؛ دۆخی چرچ و لۆچ و کۆوە بوون ☰ ١. سوزش پوست و زخم ٢. سوراخ مورچە ٣. شهر مورچگان ٤. چروک

**کز**[٢]: ئاوەڵناو. ١. ژاکاو ‹گوڵی کز› ٢. داڵگۆشت ‹مەڕی کز› ٣. سووک؛ سڤک ‹بە کێشانە هێندێک کزە› ٤. بێ ڕەواج ‹بازاڕی کز› ٥. کەمحوکم ‹چاوی کز› ☰ ١. افسُردە ٢. لاغر ٣. سبُک ٤. کساد ٥. کم سو

⊡ **کز بوون**: ١. داڵگۆشت بوون ٢. کەم کردن ٣. خەمبار بوون ☰ ١. لاغر شدن ٢. کم شدن؛ کاستن ٣. نگران بودن

**کز کردن**: ١. کزکە/ کزکۆلە کردن؛ بێدەنگ و فەقیرۆکە لە سووچێ ڕۆنیشتن ‹ئەوە بۆ کزت کردووە؟ وەرە پێشەوە دوو قسە بکە!› ٢. ڕادەی دەنگ و ڕووناکی ئامێرێک کەم کردن ‹چراکە کز کە!؛ دەنگی ڕادیۆکە کز کە!› ٣. لەڕ کردن؛ دابەزاندنی کێش ‹تۆزێ خۆت کز کە، زۆر قورس بووی› ٤. بێ ڕەواج کردن ‹کالای بیانی بەرهەم هێنانی کز کردووە› ٥. کەمحوکم کردنی چاو ‹ئەم خوێندنەوە لە تاریکی، چاوی کز کردووە› ☰ ١. کز کردن ٢. کم کردن شدت جریان چیزی (صدا، نور و ...) ٣. کم کردن وزن ٤. کساد کردن ٥. کم‌سو کردن چشم

**کز**[٣]: دەنگەناو. دەنگی هەڵقرچان (وەک: دووگ و بەز) لە سەر ئاگر ☰ جِز و وِز

**- کز**[٤]: پاشەوشە. خاوەن کزی ‹سەرکز؛ چاوکز› ☰ ضعیف

**کزاڤ / k(i)zav/**: ناو. کار و ڕەوتی پاڕانەوە؛ لالانەوە ☰ تضرُّع

**کزان / k(i)zan/**: چاوگ. کزیان: ١. چووزانەوە؛ سووزیانەوە ٢. چزان لە سەر ئاگر ٣. ئێش پێ گەیین ☰ ١. سوختن پوست ٢. جزغالە شدن بر آتش ٣. بە درد آمدن

**کزاندنەوە / k(i)zand(i)newe/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //کزاندتەوە؛ دەکزێنیەوە؛ بکزێنەوە// چووزاندنەوە ☰ سوزش پوست

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەکزاندنەوە

**کزانن / k(i)zanin/**: چاوگ. ١. کزاندنەوە ٢. دە ڕۆندا قرچاندنی دووگ و بەز ☰ ١. سوختن پوست ٢. سُرخ کردن دُنبە

**کزانەوە / k(i)zanewe/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //کزایەوە؛ دەکزێیەوە؛ بکزێوە// کزیانەوە؛ کزان ☰ احساس درد و سوزش کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: کزاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەکزانەوە

**کزبەلۆک / kizbelok/**: ☜ **کزبلۆک**

**کزخ / kizx/**: ناو. کەزاخ؛ کاری پەرتاوتنی دار ☰

هرس درخت

**کزخان** / kizxan/: ☜ **کەزخاندن**

**کزخاندن** / kizxandin/: ☜ **کەزخاندن**

**کزر** / k(i)zir/: ئاوەڵناو. پندر؛ نیوەوشک ☗ نیم‌خُشک

⊡ **کزر بون**: ۱. پنر بوونەوەی زەمینی قوڕ ۲. [کینایە] پێگەیشتن و بە خۆدا هاتن ☗ ۱. نیم خشک شدن زمین گلی ۲. شکوفا شدن

**کزر بونەوە**: کزرەوە بوون؛ نیوە وشک بوون لە پاش تەڕی ☗ نیم خشک شدن

**کزرەوە بون**: ☜ **کزر بونەوە**

**کزران**[1] / kizran/: چاوگ. سووتانی وەک موو، خوری و... ☗ سوختن مو یا پشم مانند

**کزران**[2]: ناو. شۆنە؛ زەمینێ کە درەنگ ئاو دەمژێ ☗ زمینی که دیر آب در آن نفوذ کند

**کزراندن** / kizrandin/: چاوگ. ۱. سووزاندنی موو ۲. پرووژاندنی گوڵەگەنمی فەریک ۳. بڵێسە دان؛ ڕەوشەن کردن؛ ترووسکاندن ☗ ۱. سوزاندن مو ۲. از هم باز کردن خوشه‌ی گندم کال ۳. شعله‌ور کردن

**کزری** / kizrî/: ناو. ۱. پنری؛ نیوە وشکی ۲. سووتاوی (خوری و...) ۳. کار و ڕەوتی کوزوورین؛ هەڵێنجانی ئاو لە جێگەی قووڵەوە ☗ ۱. نیم خشکی ۲. سوختگی (پشم و...) ۳. عمل بیرون کشیدن آب از عُمق

**کزرین** / kizrîn/: چاوگ. ڕەوشەن بوون؛ تروسکان؛ بڵێسە دان ☗ شعله‌ور بودن

**کزک** / k(i)zik/: ناو. چزیلک ☗ جزغاله

**کزکردو** / kizkirdû/: ئاوەڵناو. کزکۆڵە؛ کزکە؛ کزولکە؛ کزوولە؛ کزەڵۆک؛ کسکۆڵە؛ کسکە؛ کۆشکەلاتوو؛ تایبەتمەندی ئەوەی بە ناچاری یان فەقیرۆکەیی خۆی لە سووچێ خزاندووە (وەک: لە سەرمان یا برسان یان...) ☗ کزکرده

**کزکردویی** / kizkirdûyî/: ☜ **کزی**

**کزکزین** / kizk(i)zîn/: چاوگ. ڕاتلەکین؛ داچڵەکیان ☗ شوکه شدن

**کزکۆڵە** / kizkołe/: ☜ **کزکردو**

**کزکە**[1] / kizke/: ناو. نان لە بەڕوو ☗ نان از آرد بلوط

**کزکە**[2]: ☜ **کزکردو**

⊡ **کزکە کردن**: ☜ **کز کردن ـ۱**

**کزگرین** / kizg(i)rîn/: ناو. نۆبەتێ؛ لەرز لە بەر تاو ☗ تب و لرز

**کزلک** / kizlik/: ناو. قەڵەمبڕ؛ تیخی کورتی قەڵەم بڕین یان سەر و ڕیش تاشین ‹سەتڵی سەرخووسێنی تەپڵ و ئەسپی قاپقاپی حەمام/ لۆنگی جەوشەن، شیری کزلک، تۆپزی کاری ددان «سالم»› ☗ قلمتراش

**کزمک** / kizmik/: ناو. ۱. سەرکۆتەڵ؛ سەرکوێزر ۲. بنژیل؛ قرتیل؛ بن‌بێژنگی بێ کەڵک ☗ ۱. درشته‌ی کوزر ۲. تەماندەی غربال

**کزن** / k(i)zin/: ناو. ۱. کشنە؛ کوشن؛ کوشنە؛ دانەوێڵە کە بژیوە، دەیچێنن گای پێ قەڵەو دەبێ ۲. باکێشی تەندوور؛ گولوێنە؛ گوڵبێنە؛ گوڵوە ۳. گارس؛ هەرزنەگەورە ☗ ۱. کرسنە؛ از حبوبات ۲. بادکش تنور ۳. ارزن درشت

**کزوبز** / kiz û biz/: دەنگەناو. جزوبز؛ جز؛ چزوبز ☗ جزولز

**کزولکە** / k(i)zulke/: ☜ **کزکردو**

**کزونیر** / k(i)z û nîr/: ناو. ناز و گۆز؛ ئینجە و فینجە ☗ غمزه و ناز

**کزونیز** / kiz û nîz/: ناو. خەمزە؛ چاوبازی؛ نازی بە چاوان ☗ غمزه

**کزۆت** / k(i)zot/: ناو. جلەبووک ☗ لباس عروسی

**کزوری** / k(i)zûrî/: ناو. خوری سووتاو ☗ پشم سوخته

**کزولکە** / k(i)zûlke/: ئاوەڵناو. غوڕ؛ داماو؛ دژ؛ کز

🇮🇷 کزکرده

**کزوله** / k(i)zûle/: ☜ **کزکردوو**

**کزه**[۱] / k(i)ze/: ناو. ۱. شنه؛ سروه؛ بای بسکان ۲. بای سارد و تەزێن ‹به کزەی سەردی هەناسەی کەژ و کۆ/ ژینی خۆی هاتەوە بیر پیرەهەڵۆ «هەژار، *بۆ کوردستان*»› 🇮🇷 ۱. ایاز؛ نسیم ۲. باد سرد

⊡ **کزەی با**: ۱. دەنگی ناسکی سروە ‹چ ژین‌سەختم، چ دڵ‌سەختی گوڵی من!/ کزەی دڵ وەک کزەی با دێتە بەر گوێت! «هەژار، *چوارینەکان*»› ۲. ساردی و تەزی با 🇮🇷 ۱. صدای آرام نسیم ۲. سوز و سرمای باد

**کزەی جەرگ** *[مەجاز]* کزەی جەرگان؛ زۆر خۆشەویست ‹کزەی جەرگم! بەیانی زوو هەڵمسێنە/ مەڵێ با تیرەخەو بێ «پەشێو»› 🇮🇷 بسیار محبوب

**کزەی جەرگان**: ۱. ☜ **کزەی جەرگ** ۲. *[مەجاز]* دڵبەر؛ گراوی؛ ماشقە 🇮🇷 ۱. ☜ **کزەی جەرگ** ۲. معشوق

**کزە**[۲]: دەنگەناو. ۱. دەنگی وەک داغ نان لە سەر پێست ۲. دەنگی چزەچز ۳. دەنگی بای سارد 🇮🇷 ۱. صدای مانند داغ گذاشتن بر پوست ۲. صدای مانند برشتن گوشت در تابه ۳. صدای باد سرد

**کزەبا** / k(i)zeba/: ناو. سروە؛ شنە 🇮🇷 نسیم

**کزەڵۆک** / k(i)zełok/: ☜ **کزکردوو**

**کزەنە** / k(i)zene/: ناو. بۆپرووز؛ بۆکرووز؛ بۆنی ئێسک و مووی پرووزاو 🇮🇷 بوی استخوان و موی سوخته

**کزەوت** / k(i)zewit/: ناو. تام؛ چێژ 🇮🇷 طعم؛ مزه

**کزی** / k(i)zî/: ناو. کزکردوویی: ۱. سەرکزی؛ خەمۆکی ۲. لاوازی؛ داڵگۆشتی ۳. کەمی؛ کێمی 🇮🇷 ۱. افسردگی ۲. لاغری ۳. کمی

⊡ **لە کزی دان**: کز بوون؛ لەڕ و لاواز بوون 🇮🇷 لاغر و تکیده شدن

**کزیان** / kizyan/: ☜ **کزان**

**کزیانەوە** / kizyanewe/: ☜ **کزانەوە**

**کزیایوە** / kizyaywe/: چاوگ. سووتانەوە؛ برژانەوە 🇮🇷 سوختن

**کزیر** / k(i)zîr/: ناو. ۱. گزیر؛ بەردەستی پێشکار لە دێدا ۲. دەڵاڵ و جارچی بازاڕ 🇮🇷 ۱. پاکار ارباب ۲. جارچی و دلال

**کزین** / k(i)zîn/: ناو. جۆرێ تۆپی گەمە 🇮🇷 نوعی توپ بازی

**کزیە** / kizye/: ناو. ئێسکێکی چوارگۆشی نارێکە، لە ناوڕاستەوە نەختێک گێڕاوە، دوو لەم ئێسکە پێکەوە لەگەنە (سمت) پێک دێنن 🇮🇷 استخوان خاصره

**کزێنکە** / k(i)zênke/: ناو. شلکێنەی لە ڕۆندا سوورەوە کراو 🇮🇷 خمیر آبکی سرخ شده در روغن

**کژ** / kij/: ناو. ۱. خاوی با نەدراو ۲. جەنگە؛ هەڕەت ۳. کەژ؛ وەرز؛ فەسڵی ساڵ ٤. پشمە؛ پژمە 🇮🇷 ۱. خام؛ ریس تاب نخورده ۲. موسم ۳. فصل سال ۴. عطسه

**کژبلۆک** / kijb(i)lok/: ناو. کزبەلۆک؛ چاڤڕەشۆک؛ گیایەکە بنەکەی دەخورێ 🇮🇷 گیاهی با پیاز خوراکی

**کژبیاییش** / kijb(i)yayîş/: چاوگ. بە شلی و سستی ڕۆیشتن 🇮🇷 سلانه ـ سلانه رفتن

**کژژ** / kijj/: دەنگەناو. ۱. دەنگی گرمە و قرە ۲. دەنگی بای بە قەوەت 🇮🇷 ۱. صدای بلند و مهیب ۲. صدای وزیدن شدید باد

**کژک** / k(i)jik/: ☜ **کژگ**

**کژگ**[۱] / k(i)jig/: ناو. کژک؛ کشک: ۱. کەژوو؛ تەنراوێکە بە پانایی سێ ئەنگوست بە ئاڵقەوە، تەنگەی بارەبەری پێ دەدەن ۲. تەوژمی گران 🇮🇷 ۱. تنگ؛ نوار پهن بند ستور ۲. فشار زیاد

**کژگ**[۲]: ناوەڵناو. کژک؛ کشک: ۱. تەواو سووتاو ۲.

*[مەجاز]* پەشێو؛ پەرێشان ▣ ۱. کاملاً سوخته ۲. پریشان

**کژمژ / kijmij/:** ☜ **کشمیش**

**کژنگ / k(i)jing/:** ناو. چنگەنە؛ مێرووی بە پێستەوە نووساو ▣ حشرەی چسبیده بر پوست

**کژۆڵە / k(i)jołe/:** ناو. چرپی و ئالاش بۆ بن قورەبان ▣ انبیره

**کژوور / k(i)jûr/:** ناو. سەر؛ بان؛ میچ ▣ سقف

**کژوورەک / k(i)jûrek/:** ناو. ۱. ☜ **خیزەرە** ۲. تەختەی ناسکی سەری دارەڕا کە بە پانەوە دادەنرێ ▣ ۱. ☜ **خیزەرە** ۲. تختەهای نازک و پهنی که روی الوار سقف گذارند

**کژەبا / k(i)jeba/:** ناو. سەردەمی هەڵکردنی با ▣ موسم وزیدن باد

**کژەباران / k(i)jebaran/:** ناو. کژەبارانە؛ سەردەمی باران بارینی زۆر ▣ موسم باران

**کژەبارانە / k(i)jebarane/:** ☜ **کژەباران**

**کژەساڵ / k(i)jesał/:** ناو. وەرز؛ کەژ ▣ فصل

**کژیک / k(i)jîk/:** ناو. قالاو؛ قەلەڕەشە ▣ کلاغ

**کژین / k(i)jîn/:** چاوگ. پشمین؛ پژمین ▣ عطسه کردن

**کس[1] / kis/:** ناو. *[شوورەیی]* کسسا؛ کوز؛ قوز؛ شەرمی مێوینە ▣ کُس؛ آلت تناسلی ماده

**کس[2]:** دەنگ. ۱. وشەی دەنگ دانی مەڕ ۲. وشەی دنەدانی سەگ ▣ ۱. کلمەی راندن گله ۲. کلمەی برانگیختن سگ و تازی

⊡ **کس دان:** هەڵنانی سەگ و تانجی ▣ برانگیختن سگ و تازی

**کس[3]:** دەنگەناو. کش؛ وشەی دەرکردن ‹هەر هات کسیان لێ کرد› ▣ کیش

**کسا / k(i)sa/:** ناوەلکار. کسان؛ چلۆن؛ چۆن ▣ چه طور

**کساخ / k(i)sax/:** ☜ **کەزاخ**

**کسان / k(i)san/:** ☜ **کسا**

**کسب / kisb/:** ☜ **کەسب**

**کسپ / kisp/:** ☜ **کەسب**

**کسپوکۆ / kisp û ko/:** ناو. کەربوکین؛ هەستی قین و ڕک ▣ احساس خشم و نفرت

**کسپە[1] / kispe/:** ناو. ۱. خورپە؛ ڕەوتی ڕاچنینی دڵ ۲. ژانێ کە لە پڕ ئارام دەگرێ ▣ ۱. حالت دل ریختن ۲. دردی که ناگهان آرام شود

**کسپە[2]:** دەنگەناو. کفە؛ دەنگی ئاو بە ئاگردا کردن ▣ صدای آب بر آتش پاشیدن

**کسپەکسپ / kispekisp/:** دەنگەناو. کسپەی زۆر ▣ صدای خش ـ خش

**کست / kist/:** ناو. تەنیشت؛ لا؛ ئالی ▣ نزد؛ پهلو

**کستەنە / kistene/:** چاوگ. کوشتن؛ گوژتن؛ مراندن ▣ کُشتن

**کسسا / kissa/:** ناو. *[شوورەیی]* کس؛ کوز؛ شەرمی مێوینە ▣ کُس؛ آلت تناسلی ماده

**کسک / k(i)sik/:** ناو. ۱. چزلیک ۲. ☜ **کەسك[1]** ▣ ۱. جزغاله ۲. ☜ **کەسك[1]**

**کسکسین / kisk(i)sîn/:** چاوگ. ۱. گریان؛ گیریان ۲. ناڵاندن؛ گاڵین؛ زمین ▣ ۱. گریستن ۲. نالیدن

**کسکون / kiskun/:** ☜ **کەسکون**

**کسکۆڵە / kiskołe/:** ☜ **کزکردو**

**کسکە[1] / kiske/:** ناو. کوسکە؛ بریقەی چاوی پشیلە و جانەوەری کێوی لە تاریکیدا ▣ برق چشم جانوران در تاریکی

**کسکە[2]:** ☜ **کزکردو**

**کسکەکسک / kiskekisk/:** ناو. بریقە بریقی چاوی پشیلەو جانەوەری کێوی لە تاریکیدا ▣ برق چشم جانوران در تاریکی

**کسکیان / kisk(i)yan/:** چاوگ. سووزیانەوەی پێست ▣ احساس سوزش کردن در پوست

**کسکیانەوە / kisk(i)yanewe/:** چاوگ. ۱.

کسکیان؛ سووتانی پێست ۲. کزیانەوە؛ کـزان ☰ ۱. سوختن پوست ۲. احساس درد و سوزش کردن

**کسل** / k(i)sil/: نـاو. ۱. قسـڵ؛ ئاهـەک ۲. ☜ **کیسەڵ** ☰ ۱. آهک ۲. ☜ **کیسەڵ**

**کسڵ** / kisł/: ☜ **قسڵ**

**کسم** / kism/: ناو. ۱. پیشـە؛ سـنعات ۲. کسـب؛ کەسب ۳. تەرح؛ دیدار ٤. جۆر؛ چەشن؛ تەرز ☰ ۱. صنعت ۲. کسب ۳. قیافه ۴. نوع

**کسۆک** / k(i)sok/: نـاو. کوسـوک؛ کوسـۆک: ۱. سەگ ۲. تووتکە سەگ ☰ ۱. سگ ۲. تولەسگ

**کسور** / k(i)sûr/: ناو. قوماش؛ پارچە ☰ پارچه

**کـش**[۱] / kiş/: ئاوەڵـناو. بـێ‌هەسـت و خوسـت ‹دنیایەکی مات و کشە/ نە هەستە نە چرپـە و خشـە «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ ساکت؛ بی‌صدا

▣ **کش بوون**: هەلاتن؛ دەرچوون ☰ متواری شدن

**کش**[۲]: دەنگ. ۱، کیش؛ وشەیەک لـە شـەترەنجدا کە لە کاتی تەنگ پـێ‌هەڵـچنینی شـای خـەنیم دەگـوترێ ۲. وشـەی دەرکـردنی پەلـەوەر، بەتایبەت باڵندەی مالـی ☰ ۱. کـیش شـطرنج ۲. کیش؛ صدای راندن ماکیان

**کشان** / k(i)şan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //کشای؛ دەکشێی؛ بکشێ// کشکشین: ۱. بەرەو ژوور خشین ‹کۆڕی دانیشتن تا ئەهات ئەکشا/ کورسی جێـی چـوار بـوو، دەی تـێ ئەترشـا! «گـۆران»› ۲. بـە ڕووبەرێکـدا خشان و تێپەڕین ‹کشا گیسـوو بـە گۆشـەی ڕووی یارا/ چ جنسێ بێ لە مارا، بـێ بـە نـارا «سـالم»› ۳. خوشین؛ تیـژ تێپـەڕین ‹بـە ئیجعـازی ئەنگوسـتی پاکی موحەممەد/ شەتی نوور بە ڕووی مـانگی عـەرزا کشاوە «سوارە»› ٤. مـێ وە ژێـر نێـر کـەوتن بـۆ جووت بوون (تایبەتی بۆ ماین و چێڵ) ۵. ڕوو لـێ نان ‹کە کۆمەڵ ڕێی کەوت بەرەو قەرەداخ،/ سـێبەر کشابوو بۆ پێدەشتی شـاخ «گـۆران»› ٦. کێشـران؛ کێشـیان؛ نەقاشـی کـران ‹مـانی نیـەتی قـووەتی تەسـویری بـرۆی تـۆ/ ئـەم قەوسـە بـە دەسـتی موتەنەفیس نەکشاوە «نالی»› ☰ ۱. رو به بالا خزیدن ۲. بر سطحی خزیدن ۳. سریع گذشتن ۴. در زیر قرار گرفتن مـاده هنگـام جفتگیـری ۵. متمایـل شـدن ۶ نقاشی شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: کشاو/ چاوگی نەرێنی: نەکشان

**کشـاندن** / k(i)şandin/: چـاوگ. تێـەپ. //کشـاندت؛ دەکشێنی؛ بکشێنە// کشانن: ۱. ڕەکێش کردن بـە زەویـدا ۲. ڕاکێشـانی گـوریس و لاسـتیک ۳. سەنگاندن بە تەرازوو ٤. ئەسپ یان کەوی مێ لـە نێر چا کردن ☰ ۱. بر زمین کشیدن ۲. کش آوردن ۳. وزن کردن ۴. اسب یا کبک ماده را جُفت نر آن کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەکشاندن

**کشـــاندنەوە** / k(i)sand(i)newe/: چــــاوگ. کشاننەوە: ۱. بەرەو پاش بردن ‹ڕووسیا بەشێک لە هێزەکانی لە سنووری ئۆکراینا کشاندەوە› ۲. دیسان سەنگاندن؛ جارێ تر لە سەر ترازوو نـان ☰ ۱. بـە عقب کشیدن ۲. دوباره وزن کردن

**کشـان ـ کشـان** / k(i)şan k(i)şan/: ئاوەڵـکار. ۱. ڕەکێش ـ ڕەکێش؛ کاری بە زەویدا ڕاکێشان لـە سەر یەک ۲. کاری هێدی ـ هێدی بە ڕێدا هاتن ☰ ۱. کشان ـ کشان ۲. سلانه ـ سلانه

**کشانن** / k(i)şanin/: ☜ **کشاندن**

**کشاننەوە** / k(i)şannewe/: ☜ **کشاندنەوە**

**کشانەوە** / k(i)şanewe/: چاوگ. تێنەپەڕ. //کشایەوە؛ دەکشـێیەوە؛ بکشـێوە// ۱. بـەرەو دوا چـوون ‹لەشکری دژمن کشایەوە و بەرەو دوا بۆوە› ۲. درێژ بوون بە ڕاکێشان ‹هەتا بیکێشی، زیاتر لە بەر یـەک دەکشێتەوە!› ☰ ۱. واپس رفتن ۲. کش آمدن

■ ئاوەڵناوی بـەرکاری: کشـاوەوە/ چـاوگی نـەرێنی: نەکشانەوە

**کشاو** / k(i)şaw/: ☜ **کێشراو**

**کشپل** / kişpil/: ☜ **کشپەڵ**

**کشپەڵ / kişpeł/**: ناو. بشکول؛ پشکەڵ؛ پشکەڵ؛ کشپل؛ قشپل ☰ پشکَل

**کشپەنە / kişpene/**: ناوەڵناو. کوشپەنە؛ خۆبایی؛ فیزن؛ لووتبەرز؛ خۆ بە زل زان ☰ مغرور

**کشت / kişt/**: ناو. ١. کار و ڕەوتی چاندن؛ تۆم وەشاندن ٢. کار و ڕەوتی دابین کردنی ژینگەی لەبار بۆ گەشە پێ دانی میکرۆب یان هەر خانەیەکی زیندوو بە مەبەستی لێکۆڵینەوەی ☰ ١و٢. کِشت

**کشتا / kişta/**: ☜ کوژراو

**کشتاڤیتس / kiştavîtis/**: ناوەڵناو. تخێلبوو؛ ڕاست ڕاکشاو ☰ دراز به دراز افتاده

**کشتاکەوتش / kiştakewtiş/**: ناوەڵناو. ١. سلارەوە بوو ٢. تخێلکەوتوو ٣. دانیشتووی بە پاڵەپشت ☰ ١. از پای درآمده ٢. دراز کشیده ٣. تکیه داده

**کشتش / kiştiş/**: ☜ کوژران

**کشتکانی / kiştkanî/**: ناوەڵکار. ١. دەمەوڕوو ٢. لابەلا ٣. لارەولار ☰ ١. دمر ٢. یک وری ٣. تلو ـ تلو

**کشتوکار / kişt û kar/**: ☜ کشتوکاڵ

**کشتوکاڵ / kişt û kał/**: ناو. کشتوکار؛ کار و ڕەوتی چاندن و کێلان ☰ کشت و کار؛ کشاورزی

**کشتوکنار / kişt û k(i)nar/**: ناو. دەور؛ دەوروبەر ☰ پیرامون

**کشتۆخ / kiştox/**: ناو/ ناوەڵناو. مێرکوژ؛ کوژەر ☰ قاتل

**کشتە / kişte/**: ناو. ١. کوشتە؛ کوژراو؛ کوژیاو؛ کوژیاگ ‹فیدات بوون ئامان سا هۆر کەر! با بەی/ وە سەر کشتەمدا پەی ـ پەی جەو جۆی مەی «مەولەوی»› ٢. خالیگە؛ لابرک ٣. کۆڵ؛ شان ٤. لا؛ ئالی ☰ ١. کُشته شُده ٢. تُهیگاه ٣. گُرده ۴. طرف

**کشتەک / kiştek/**: ناو. گشتەک؛ چەند داوە دەزووی پێکەوە بادراو ☰ رشتەی نخ

**کشتیار / kiştyar/**: ناو. جووتبەندە؛ جووتیار ☰ کشاورز

**کشتیلە / kiştîle/**: ناو. ئەسکوێ؛ مەلاقەی گەورە ☰ ملاقەی بزرگ

**کشتێل / kiştêl/**: ☜ کەوچێز

**کشک / k(i)şik/**: ☜ کژگ

**کشکش[1] / kişkiş/**: ناو. جۆرێ داوەت و ڕەقس ☰ نوعی رقص

**کشکش[2]**: دەنگ. ١. وشەی دەرکردنی مریشک ٢. وشەی دنەدانی تاژی بۆ ڕاو ☰ ١. کلمەی راندن مُرغ ٢. کلمەی برانگیختن سگ شکاری

**کشکشان / kişk(i)şan/**: چاوگ. ١. ڕەقسین لە داوەتی کشکشدا ٢. ڕەکێش کران بە زەویدا ☰ ١. نوعی رقص ٢. بر زمین کشیده شدن

**کشکشاندن / kişk(i)şandin/**: چاوگ. ١. ڕەکێش کردن بە زەمینیدا ٢. کشکشین؛ وە درەنگ خستن ☰ ١. بر زمین کشیدن ٢. کش دادن؛ به تأخیر انداختن

**کشکشین / kişk(i)şîn/**: چاوگ. ١. ☜ کشان ٢. ☜ کشکشاندن ـ٢

**کشکە / kişke/**: ناو. ئادە؛ بژار ☰ وجین

**کشکەوڕ / kişkewiř/**: ناو. کێژکاوڕ؛ باوێشک؛ باوشک ☰ خمیازه

**کشگ / kişg/**: ناو. هەزارپێ؛ هەزارپا؛ زێلوو ☰ هزارپا

**کشل / k(i)şil/**: ناو. کسل؛ قسل؛ ئاهەک ☰ آهک

**کشمش / kişmiş/**: ☜ کشمیش

**کشمیش / kişmîş/**: ناو. کشمش؛ کشمیشی؛ کوشمیشی؛ کژمژ؛ مەویژ؛ مەووژ؛ ئیشکەوەکراوی ترێی بێدەنک ☰ کشمش

▣ **کشمیشی کاولیان**: دەمووکانە؛ دەنووکە؛ دارخوەرک؛ چەسپەڵۆک ☰ مویزک

**کشمیشی[1] / kişmîşî/**: ناو. ١. ترێی وردی بێدەندک ٢. ☜ **کشمیش** ☰ ١. کشمشی؛ انگور

بی‌دانە ۲. ☜ **کشمیش**

**کشمیشی**[۲]: ئاوەڵناو. سەر بە کشمیش ‹هەنگوور کشمیشی› ☰ کشمشی

**کشن** / k(i)şin/: ئاوەڵناو. خەل؛ هەراو؛ گوشاد ☰ گشاد

**کشنە** / kişne/: ناو. ۱. ☜ **کزن ـ۱** ۲. هەر دانەوێڵەیەک کە بە ئاژەڵ دەدرێ ☰ ۱. ☜ **کزنـ۱** ۲. آنچە از غلات کە بە حیوان دادە شود

**کشنیز** / kişnîz/: ☜ **گژنیژ**

**کشنیژە** / kişnîje/: ناو. جۆرێ مووروگی ئاڵتوون و زیو بۆ زەنبەر ☰ نوعی مُهرەی زینتی از طلا و نقرە

**کش‌ومات**[۱] / kiş û mat/: ناو. *[کینایە]* بارودۆخێ کە هیچ ڕێگایەک بۆ دەربازبوون شک نەچێ ☰ شرایطی کە نە راه پیش باشد نە پس

**کش‌ومات**[۲]: ئاوەڵناو. ۱. بێ‌دەنگ؛ ئارام ‹کش‌وماتە جیهان لە ژوانی لە نوێ/ گەلاوێژ بۆ مە دەروانێ لە سەر سوێ «هەژار، *چوارینەکان*»› ۲. تایبەتمەندی شای شەترەنج، کاتێ کەوتۆتە بەر «کش» و ڕێگای جوولانیشی نییە ☰ ۱. آرام و دنج ۲. کیش‌ومات (شطرنج)

**کش‌ومات**[۳]: سارستە. دەستەواژەیەکە لە شەترەنجدا دەگوترێ ☰ کیش‌ومات؛ اصطلاحی در شطرنج

**کشۆل** / k(i)şol/: ☜ **شۆقل**

**کشە**[۱] / k(i)şe/: ناو. پێدزە؛ بەرەو دواچوونی لەسەرخۆ ☰ عمل پا پس کشیدن

**کشە**[۲]: دەنگ. وشەی دەرکردنی باڵدار ‹کشە! کشە! پۆپەڕەشە/ میوان شەوێک دوان خوەشە «مەسەل»› ☰ اصطلاحی برای راندن پرندە

**ـ کشە**[۳]: پاشەوشە. کشانەوە؛ کێشانەوە ‹پاشەکشە› ☰ ـکِش

**کشیایا** / kişyaya/: ☜ **کوژراو**

**کشیایە** / kişyaye/: ☜ **کوژراو**

**کشیاییش** / kişyayîş/: چاوگ. کوشتن؛ مێر کوشتن؛ مراندن ☰ کُشتن

**کشین** / k(i)şîn/: چاوگ. بە پەلە ڕابردن ☰ با سرعت گُذشتن

**کف**[۱] / kif/: ئاوەڵناو. کففە؛ کفە: ۱. وەکری؛ کراوە ۲. باکردوو؛ ماسیگ ☰ ۱. باز ۲. بادکردە

⊡ **کف کردن**: با کردن؛ بە با پەنەمان ☰ باد کردن

**کف**[۲]: دەنگ. کففە؛ کفە: ۱. دەنگی هەڵچوون و سەرڕێژ کردنی جۆش هاوردە لە دیزە و بەرۆشدا ۲. دەنگی تراوێ کە بە تەوژم لە تەنگەبەرێکەوە دەرپەڕێ ☰ ۱. صدای بالا آمدن و جوشیدن مایع ۲. صدای با فشار بیرون زدن مایع

**کفارە** / k(i)fare/: ☜ **کوفارە**

**کفاندن** / k(i)fandin/: چاوگ. لووشنای؛ کیفاندن؛ وەک مار دەنگ کردن ☰ صدا درآوردن مثل صدای مار

**کفای** / k(i)fay/: چاوگ. کۆخین؛ قۆزین ☰ سُرفە کردن

**کفت**[۱] / kift/: ناو. ۱. گولی؛ گوڕی؛ نویرە؛ نەخۆشی خۆرە ۲. ڕەڵم؛ ڕەمڵ ۳. کفت‌وکۆ؛ ڕەوتی جۆش خواردنی بە تەوژم ٤. شان و پیل ☰ ۱. بیماری خورە؛ جُذام ۲. ماسە ۳. فرایند بە شدت جوش خوردن ۴. سرشانە و کتف

**کفت**[۲]: ئاوەڵناو. ۱. کوفت؛ شەکەت ‹ماندوو، خەستە، شەکەت، کفت/ لە سەر تەختێکی زێرکفت «هێمن»› ۲. بێ‌ناڵ ‹ئێسترە شین کفتە، دەبێ ناڵ کرێ› ☰ ۱. خستە ۲. بی‌نعل

**ـ کفت**[۳]: پاشەوشە. ـکوت ‹زێرکفت؛ زێوکفت› ☰ ـکوب

**کفتک** / kiftik/: ناو. ۱. ☜ **کفتەـ۱** ۲. ☜ **کرمیت**

**کفتکاری** / kiftkarî/: ناو. کفت‌وکوڵ؛ کار و ڕەوتی ڕەنگ تێ‌هەڵساوین ☰ رنگ‌آمیزی

**کفت‌وکوڵ** / kift û kuł/: ناو. کفتکاری؛ کار و ڕەوتی ڕەنگ تێ‌هەڵساوین ☰ رنگ‌آمیزی

**کفتوکۆ** / kift û ko/: ناو. ١. کەفوکول؛ جۆش و تەوژمی گەرما ٢. هەڵکشە و داکشە؛ ڕەوتی هاتنە بان و چوونە خواری گەڕایگەڕی ئاوی دەریا لە ڕۆژ و شەودا ٣. [مەجاز] ئازار و مەینەت؛ ڕەنج ‹کە پاش ئەو ڕەنج و دەرد و کفتوکۆیە/ دەبینن کۆتەڵی حاجی لە کۆیە «هێمن»› ⚑ ١. جوش و حرارت ٢. جزر و مد ٣. رنج و محنت

▣ **کفتوکۆی شتێ دامرکان/ دامردن:** کەفوکول نیشتنەوە؛ کوڵ‌وکۆ دامرکان ‹باش بوو سەرەنجام کفتوکۆی دڵی دامرکا و ڕۆیەوە سەر کارەکەی!› ⚑ از شدت و هیجان چیزی کاستن

**کفته** / kifte/: ناو. ١. کفتک؛ کوفتە؛ تۆپەڵ کراوی ساوەر و برنج و گۆشت بۆ ناو چێشت ٢. بێ‌ناڵی بارەبەر ⚑ ١. کوفتەی خوراکی ٢. بی‌نعلی ستور

**کفتەخۆر** / kiftexor/: ناوەڵناو. [کینایە، پلار] تەمەڵی کارنەکەر و نەوسن ⚑ تنبل بیکارە و پُرخور

**کفتی** / kiftî/: ناو. شەکەتی؛ ماندوویەتی ⚑ خستگی

**کفر** / kifr/: ناو. کوفر: ١. ناوە؛ ناموسڵمانی ٢. دژبەرایەتی لەگەڵ خودا ٣. دۆخی زانینی ڕاستەقینە و مل لێ بادانی ٤. دارێکی دەوەنە زۆرتر لە دەم چەمان دەڕوێ ٥. ڕەنگی ڕەش ٦. جگ؛ قاپ لە بازی جگێندا ٧. سخێف؛ جوێن؛ دژمێن؛ جنێو ⚑ ١تا٣. کُفر ٤. درختچەای است ٥. رنگ مشکی ۶. شتالنگ در نوعی بازی ٧. دُشنام

▣ **کفر کردن:** کفر گوتن؛ قسەی دژ بە دین گوتن ‹بۆچی کفر دەکەی؟ تۆ بۆ خۆت کار ناکەی خودا چی بکا؟› ⚑ کُفر گفتن

**کفریت** / kifrît/: ☜ **کرمیت**

**کفرێن** / kifrên/: ناو. جۆرێ کایە بە جگ ⚑ نوعی قاپ‌بازی

**کفش** / kifş/: ناوەڵناو. کفش؛ ئاشکرا؛ خۆیا ⚑ آشکار

**کففه** / kiffe/: ☜ **کف**

**کفک** / k(i)fik/: ☜ **کەڕوو**

**کفکۆ** / kifko/: ناو. عفوونەت؛ چڵک ⚑ عفونت

**کفکێ** / kifkê/: تیروێ؛ دارێکی دەوەنە بنی با دەدەن دەرمانی بالووکەیە ⚑ درختچەای است

**کفگە** / kifge/: ناو. چڵک و کرێژی لەش ⚑ چرک و شورەی تن

**کفگیر** / kifgîr/: ☜ **کەوگیر**

**کفن** / k(i)fin/: ناو. کەفەن؛ کەپەن؛ کفۆ؛ جامەمەرگ؛ قەرقە؛ قەرقەل؛ خەلات؛ خلات؛ جیاز؛ جاو؛ تاووس؛ خەلاتی؛ بەرگی مردوو؛ پارچەیەک (زۆرتر جاوە) کە مردووی تێدا دەپێچنەوە و لە قەبری دەنێن ⚑ کفن

▣ **کفن درین:** [کینایە] لە نەخۆشی زۆر گران ڕزگار بوون ‹مام پیرۆت ئەمجارەش کفنی دڕی، بەلام عومری زۆر پێوە نەماوە› ⚑ از بیماریِ خطرناک بهبود یافتن

**کفن کردن:** دە کفنەوە پێچان ⚑ کفن کردن

**کفنای** / kifnay/: چاوگ. کۆخین؛ قۆزین ⚑ سُرفە کردن

**کفن‌دز** / k(i)findiz/: ناو. ١. کەفەن‌دز؛ دزێ کە قەبر بداتەوە بۆ کفن دزین ٢. [کینایە] کەفەن‌دز؛ کەوش‌دز؛ مرۆی گۆسارتمە و بێ‌چاو و ڕوو ٣. ☜ **کەمتار** ⚑ ١و٢. کفن‌دُزد ٣. ☜ **کەمتار**

**کفنک** / kifnik/: ناو. لمبۆز؛ قەپۆز ⚑ پوزە

**کفن‌ودفن** / kifn û difn/: ناو. کار و ڕەوتی دە جامەمەرگ پێچانی مردوو و ناشتنی ⚑ کفن و دفن

**کفۆ** / k(i)fo/: ☜ **کفن**

**کفه** / k(i)fe/: ☜ **کف**

**کڤارگ** / k(i)varg/: ☜ **کارگ ـ١**

**کڤر** / kivr/: ناو. گڤر؛ گورپە؛ گوربە ⚑ گُربەی نر

**کڤش** / kivş/: ☜ **کفش**

**کڤلۆشک** / kivloşik/: ناوەڵناو. قرمچی؛ هەڵقرچاو؛

سیس ☰ چروک

**کڤلیشک / kivlîşik/**: ناو. بژانگ؛ برژانگ؛ مـژۆڵ ☰ مُژه؛ مُژگان

**کڤی / k(i)vî/**: ناو. کووپەڵەی دەمتەنگ ☰ کوزەی دهانه تنگ

**ککەو / k(i)kew/**: ☜ **کەیکف**

**کل**[1] **/ kil/**: ناو. ۱. سورمە؛ کڵ؛ کلە ‹کلم نەماگە لە کلدانەدا/ وەختە خۆم بدەم بەو سیروانەدا «فولکلۆر»› ۲. کـار و ڕەوتی لادان؛ لاڕێ بـوون ۳. قوبـە؛ گونبەز؛ گومەز ٤. ڕەوانـە؛ کـاری نـاردن؛ بـەڕێ کردن ٥. ڕەوتی درەوشانی هەسارە ٦. هێمـا وە دەس بۆ خواحافیزی ۷. تینی ئاگر ۸. کولەکولی گەرما ☰ ۱. سُرمه ۲. انحراف ۳. گُنبد ۴. روانه؛ ارسال ۵. سو ـ سو؛ حالت چشمک زدن ستاره ۶. عمل دست تکان دادن برای خداحافظی ۷. حرارت آتش ۸. شدت گرما

⊡ **کل بوون**: ۱. بـەڕێ کـران ۲. درەوشـینەوەی ئەسـتێرە ☰ ۱. فرسـتاده شـدن ۲. چشـمک زدن ستاره

**کل کردن**: ناردن؛ ڕەوانە کردن ‹کتاوەکـە ئـەڕات کل کردم› ☰ فرستادن

**کل کرن**: چاو ڕەشتن بە سورمە ☰ سُرمه کشیدن چشم

**کل**[2]: ئاوەڵناو. ۱. خـوار؛ لار ۲. زۆر چـەرمگ ☰ ۱. کج؛ منحرف ۲. بسیار سفید

⊡ **کل بوون**: کـلا بـوون ‹لـە ڕێگـە کـل بـووە› ☰ مُنحرف شدن

**کل کردن**: خوار/ لار کردنەوە ☰ کج کردن

**کلا / k(i)la/**: ئاوەڵناو. ۱. لە شوێن خۆ دەرچـوو ۲. بێتەرەف؛ دوورەپەرێز ☰ ۱. مُنحرف ۲. کنارەگیر

⊡ **کلا بوون**: ۱. لە ڕێ لادان ‹بە گۆران ناکرێ قەت تەرکی سەودا/ کلا نابم لە سەر جـادەی هیدایـەت «گۆران»› ۲. دوورەپەرێز وێستان ☰ ۱. مُنحرف شدن از راه ۲. کنارەگیری کردن

**کلابو / k(i)labû/**: ئاوەڵـناو. لاڕێ؛ بێقـام؛ هەتڵـە؛ لەڕێدەرچوو ☰ گُمراه

**کلاچ / k(i)laç/**: ئاوەڵناو. بایی؛ بەدەعیـە؛ بـەفیز ☰ مُتکبر

**کلارینێت / k(i)larînêt/**: نـاو. قەرەنـەی؛ نـەیارەش ☰ قرەنَی

**کلاس / k(i)las/**: نـاو. کـەلاس: ۱. پـۆلی فێرگـە ‹کلاسـەکەمان سـی کورسـی تێدایـە› ۲. پـۆل؛ قۆناغێکی دیاریکراو لە خوێندن ‹کلاسـی چـوارە› ۳. نێرمامز؛ ئاسکی نێر ٤. ئاستێ لە چـاکی یـان خراپی ☰ ۱و۲. کلاس ۳. آهوی نر ۴. کلاس

**کلاسور / k(i)lasur/**: نـاو. بەرگێ کە دوو یان چـوار فەنەری هەیە بۆ دەستە ــ دەسـتەکردنی کاغـەز یان مقەبا ☰ کلاسور

**کلاسە / k(i)lase/**: ناو. ڕیز؛ ڕزن؛ ڕەج ☰ رده

**کلاسـیک / k(i)lasîk/**: ئاوەڵـــناو. ۱. کـــۆن؛ گرێخواردوو بە کاتی گەشەی هونەر و وێـژە لـە ڕابردوودا ‹چاخی کلاسیک لە مێژووی ئورووپـادا بـە سەردەمی دەسەڵاتداری یۆنـان و ڕۆم دەگـوترێ› ۲. وانەیی؛ پێوەندیدار بە وانەی فێرگەییەوە ‹هونەری کلاسیک› ☰ ۱و۲. کلاسیک

**کلاشـینگە / k(i)laşînge/**: نـــاو. قەڵماســـــک؛ قۆچەقانی؛ بەرەقانی؛ کەلاسینگ ☰ قلاسنگ

**کلاق / k(i)laq/**: ناو. قەل؛ قالاو ☰ کلاغ

**کلام / k(i)lam/**: ناو. قام؛ گۆرانی؛ چڕە ☰ ترانه

**کلان / k(i)lan/**: چـاوگ. ژەنــدن و ڕاتلــەکاندن (وەک: مەشکە و...) ☰ تکان دادن (مانند: مشک و...)

**کلانە / k(i)lane/**: ☜ **کەلارە**

**کلای / k(i)lay/**: نـاو. گـورگ؛ گـوری؛ وەرگ ☰ گُرگ

**کلایی / k(i)layî/**: ناو. لاڕێگەری؛ کار و ڕەوتی کلا بوون ☰ کجروی

**کلب** / kilb/: ناو. ۱. کەڵب؛ کەڵبە؛ کەڵپ؛ کەڵپە؛ کەلوە؛ کێلب؛ ددانی پێشەوەی سەگ و دڕندە ۲. گوڵمێخ؛ سنگی درێژ و ئەستوور ☰ ۱. ناب؛ دندان پیشین درنده ۲. میخ‌طویله

**کلبازک** / kilbazik/: ناو. ۱. گوڵەنەورۆزە ۲. سەمەنی؛ گیای لە دەفرا شین‌کراوە بۆ نەورۆز ☰ ۱. از گل‌های بهاری ۲. سبزەی شب عید

**کلپاتە** / kilpate/: ناو. فزە؛ کەمترین دەنگ ☰ کمترین صدا

**کلتور** / kiltur/: ناو. سورمەدان؛ کلدان ☰ سُرمەدان

**کلتور** / kiltûr/: ☞ **کلدان**

**کلتە** / kilṭe/: ☞ **کلدان**

**کلج** / kilc/: ☞ **کلچێو**

**کلچان** / kilçan/: ناو. فانۆز؛ فانووس؛ لەنتەری؛ چرا دەستی ☰ فانوس

**کلچک** / kilçik/: ☞ **کلچێو**

**کلچۆ** / kilço/: ☞ **کلچێو**

**کلچۆڤ** / kilçov/: ☞ **کلچێو**

**کلچۆک** / kilçok/: ☞ **کلچێو**

**کلچوک** / kilçûk/: ناو. ۱. بەڕوولەی زۆر وردی خەیار کە هێشتا گوڵەکەی پێوەیە ۲. ☞ **کلچێو** ☰ ۱. ثمر ریز خیار کە هنوز گلش نریختە است ۲. ☞ **کلچێو**

**کلچیو** / kilçîw/: ☞ **کلچێو**

**کلچێو** / kilçêw/: ناو. کلج؛ کلچک؛ کلچۆ؛ کلچۆڤ؛ کلچۆک؛ کلچووک؛ کلچیو؛ کلچێوک؛ کەلج؛ مێل؛ ئەو چێوە لووس و باریکە کلی پێ دەچاو دەکێشن ‹حەیفە چاوێ کە جەفا کۆلەوەژی تێ دەشکاند/ تۆ بە کلچێوی وەفا عەینی گەلاوێژی نەکەی! «شوکری فەزلی»› ☰ میل سُرمەکشی

**کلچێوک** / kilçêw(i)k/: ☞ **کلچێو**

**کلچێوکەگورگانە** / kilçêwkegurgane/: ناو. گیایەکە نێرتکێ سووری ئاماڵ ڕەش دەکا ☰ گیاهی است

**کلدان** / kildan/: ناو. کلتوور؛ کلتە؛ کلدان؛ کلەدان؛ کەلتە؛ سورمەدان ☰ سُرمەدان

**کلدومان** / kilduman/: ناو. هەڵم و بۆغی چڕ ☰ بُخار مُتراکم

**کلر** / k(i)lir/: ناو. کلیر؛ کونی درگا؛ جێ کلیل لە درگادا ☰ جاکلیدیِ در

**کل‌ڕێژ** / kilřêj/: ناوەڵناو. بە کل ڕێژراو؛ سورمەکێشراو ‹ئەی گوڵ وا هەڵسا گۆرانی بێژت/ هەڵبڕە چاوی شەرمی کل‌ڕێژت «گۆران»› ☰ جاکلیدیِ در

**کلس** / kils/: ☞ **قسڵ**

**کلساندن** / kilsandin/: چاوگ. پێوە نووساندن؛ چەسپاندن ☰ چسباندن

**کلسم** / kilsim/: ناو. گیایەگی دەشتەکییە ☰ گیاهی صحرایی

**کلسین** / kilsîn/: ناو. گووش؛ کندر؛ هەودای گیاکندر کە بۆ چنینی تەناف و گۆنی و... دەبێ ☰ گیاه کنف

**کلک** / kilk/: ناو. ۱. دوو؛ جووچکە؛ دووچکە ۲. قامک؛ تبل؛ تل؛ ئەنگوست ۳. قەڵەم؛ پێنووس ٤. دەسک؛ دەسە ☰ ۱. دُم ۲. انگشت ۳. قلم ۴. دستە

⊡ **کلک بادان:** *[پلار]* ۱. زمان‌لووسی و مەرایی کردن ۲. ناچار کردن بە کارێک ☰ ۱. چاپلوسی کردن ۲. ناچار کردن

**کلک پێوە کردن:** *[شووروەیی]* ۱. بز؛ جووز پێوەکردن ۲. *[کینایە]* خەڵەتاندن؛ فریو دان ☰ ۱. انگُلک کردن ۲. فریب دادن

**کلک پێ هەڵپەساردن:** *[مەجاز]* گوێ نەدان بە کار؛ خۆ گێل کردن لە ئەنجامدان ☰ اهمال کردن

**کلک گرتن:** ۱. کلک بڵند کردنی ئەسپ لە غاردا ۲. *[مەجاز]* خستنە ناچارییەوە ☰ ۱. دم بلند نگەداشتن اسب ۲. در تنگنا گذاشتن

**کلک گرتنه ناو گەلۆز:** *[کینایە، پلار]* کلک نانە نێو گەلۆز؛ خۆ بردنە یەک لە ترسان و هەلاتن ‹تووڕەیی خەڵکی کە دی، وا کلکی گرتە ناو گەلۆز/ دوژمنی خوێری، وەکوو ڕێوی لە ترسی داری کورد «هێمن»› ☰ فلنگ را بستن

**کلک نانە نێو گەلۆزەوە:** ☜ **کلك گرتنە ناو گەلۆز**

**کلک هەڵسووڕاندن:** *[پلار]* لاساری کردن؛ پێ چەقاندن و بە قسە نەکردن ☰ لجاجت کردن

**کلکاف / kilkaf/:** ناو. بەرێکی دارمازوو ☰ نوعی ثمر مازوج

**کلکان / kilkan/:** ئاوەڵناو. *[مەجاز]* حۆل و کەمهۆش ☰ خُل و منگ

**کلکانی / kilkanî/:** ناو. گێلی؛ حۆلی ☰ کم‌هوشی

**کلکبڕاو / kilkb(i)ṙaw/:** ئاوەڵناو. قوند؛ قول ☰ دُم‌بریده

**کلکبەس / kilkbes/:** ناو. قامکبەند ☰ انگشت‌بند

**کلکپەڕیو / kilkpeṙîw/:** ئاوەڵناو. قول؛ جووچکە قرتیاگ ☰ دُم‌بُریده

**کلکتەقنە / kilkteqne/:** ☜ **کلکهەڵتەکێنە**

**کلکتەقێنە / kilkteqêne/:** ☜ **کلکهەڵتەکێنە**

**کلکدار / kilkdar/:** ئاوەڵناو. ١. خاوەن کلک ٢. بە دەستە؛ دەسکدار ٣. دواییدار ☰ ١. دارای دُم ٢. دستەدار ٣. دُنبالەدار

**کلکدرێژ / kilkd(i)rêj/:** ناو. قشقەڕە؛ قشقاڕە؛ قشکەڵە ☰ زاغی

**کلکزەردە / kilkzerde/:** ناو. ١. تۆرەمەیەک باڵندەن کە دوو جۆریان هەیە: کلکزەردە و میوەخۆرە ٢. بازی کلاودار؛ ئەم باڵندەیە بە کاکۆڵی شینی ئاماڵ پەمەیی، کلکی کورت و سەری زەردی دەناسرێتەوە، فڕینی وەک سێرووبە، زوو دەستەمۆ دەبێ، لە دەوری پەرژین و باغان لە میوەی وەک توو دەگەڕێت ☰ ١و٢. بال‌لاکی

**کلکسوورە / kilksûre/:** ناو. خێزانە باڵندەیەکە لە تۆرەمەی ڕەشیشە، نزیک ١٥ سانتیمیتر دەبێ، چەن جۆریان هەیە: کلکسوورەی ئاسایی، پشتشێ، ڕەش و کێوی ☰ دُم‌سرخ

**کلکقرتاو / kilkqirtaw/:** ئاوەڵناو. جووچکەبڕیاگ ☰ دُم‌بُریده

**کلکقوڵە / kilkquḷe/:** ئاوەڵناو. کەلی؛ کوند ☰ دُم‌کوتاه

**کلکگر / kilkgir/:** ئاوەڵناو. تایبەتمەندی ئەسپێ کە لە غاردا کلکی ڕاست بڵند دەکا ☰ ویژگی اسبی که در چهارنعل دمش را بلند نگه می‌دارد

**کلکگەزە / kilkgeze/:** ناو. قشقەڕە؛ قەلەباچکە ☰ زاغی

**کلکگیر / kilkgîr/:** ناو. قوشقونە؛ پاڵۆ؛ پاڵدوو ☰ پاردُم زین اسب

**کلکلک / kilk(i)lik/:** ناو. شمشێرەی درگا ☰ کلید کلون چوبی در

**کلکلە / kilk(i)le/:** ناو. فەزیحەت؛ هۆی ئابڕوو چوون ☰ مایەی رسوایی

**کلکن / kilkin/:** ئاوەڵناو. ١. کلکدار ٢. زۆر بە خوری (بۆ پەز) ٣. ماسیو؛ هەڵتۆقیو لە پێست ☰ ١. دارای دُم ٢. بسیار پشمالو (گوسفند) ٣. آماسیده

**کلکنیشان / kilknîşan/:** ئاوەڵناو. زۆر سەیر، یان زۆر باش ☰ انگشت‌نما

**کلکە / kilke/:** ناو. ١. دەنکێکە لە ناو گەنمدا ٢. *[مەجاز]* زارۆی نەخوازراو و سەربار ٣. جێ شوێنی بڕانەوەی کێو ٤. درێژەی قسە و کار ٥. قونچکی هێشوەترێ ٦. *[مەجاز]* ئاخر و ئۆخر؛ کۆتایی ‹من هێندە ئەخۆمەوە لە کلکەی شابان/ مەست و کەلەلا بۆی دەکەوم تا جێژن «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ☰ ١. دانەای در میان گندم ٢. بچەی انگل و سربار ٣. دنبالەی کوه ۴. دنبالەی سخن و کار ۵. بخش غیرخوراکی خوشەی انگور ۶ اواخر

**کلکه‌توته / kilketûte/**: ناو. تووته؛ گولاتی؛ قامکه‌چکۆله‌ی ده‌ست ≡ انگشت کوچکه

**کلکه‌ته‌شی / kilketeşî/**: ناو. که‌وچکه‌قوله‌؛ به‌چکه‌بۆقی هێشتا لاق لێ ده‌رنه‌هاتوو ≡ نوزاد قورباغه

**کلکه‌داس / kilkedas/**: ناو. که‌رگه‌داس؛ ده‌سکه‌داس ≡ دسته‌ی داس

**کلکه‌دۆمانه / kilkedomane/**: ناو. باریکه‌یه‌ک گه‌نم له خه‌رماندا که هێشتا نه‌بۆته مالۆسکه ≡ دنباله‌ی خرمن

**کلکه‌ڕه‌شه / kilkeřeşe/**: ناو. هه‌وسار؛ ئه‌وسار؛ ده‌سکه‌وسار؛ جڵه‌و ≡ افسار

**کلکه‌ڕه‌قه / kilkeřeqe/**: ناو. نه‌خشێکی قاڵی ≡ نقشی در قالی

**کلکه‌ڕێوی / kilkeřêwî/**: ناو. ۱. به‌ری گیایه‌که ۲. چه‌شنێ ترێ؛ جۆرێ هه‌نگوور ≡ ۱. ثمر گیاهی است ۲. نوعی انگور

**کلکه‌سوته / kilkesûte/**: ☜ **کلکه‌له‌قێ**

**کلکه‌سوته‌که‌ر / kilkesûteker/**: ناو. *[کنایه]* جاملووس؛ ڕووپاما؛ هولیسک ≡ متملق

**کلکه‌سوته‌کێ / kilkesûtekê/**: ☜ **کلکه‌له‌قێ**

**کلکه‌سوتێ / kilkesûtê/**: ☜ **کلکه‌له‌قێ**

**کلکه‌فلێ / kilkef(i)lê/**: ناو. *[کنایه]* جووچکه‌له‌قێ؛ خولته؛ ڕووبینی ≡ تملق

**کلکه‌قنگێ / kilkeqingê/**: ناو. *[شووره‌یی]* کلکه‌کنگێ: ۱. بز؛ کاری قامک بۆ بردن ۲. *[کنایه]* کاری دنه دان بۆ تووره کردن ≡ ۱. انگُلک ۲. تیز کردن

**کلکه‌کنگێ / kilkekingê/**: ☜ **کلکه‌قنگێ**

**کلکه‌که‌ڵه / kilkekeļe/**: ☜ **که‌ڵه‌نه‌نگوست**

**کلکه‌لغاو / kilkel(i)ğaw/**: ناو. جه‌له‌و؛ هه‌وسار؛ جه‌ڵه‌ب؛ کلکه‌ڕه‌شمه ≡ افسار

**کلکه‌له‌قه / kilkeleqe/**: ناو. قیره‌قیر؛ دژواری زۆر له پێک هێنانی کاردا ‹به کلکه‌له‌قه نه‌جاتم بوو› ≡ سختی بسیار در انجام کار

**کلکه‌له‌قێ / kilkeleqê/**: ناو. ناو. کلکه‌سووته؛ کلکه‌سووتێ؛ کلکه‌سووته‌کێ: ۱. کاری کلک ڕاته‌کاندنی سه‌گ بۆ که‌سێ که خۆشی ده‌وێ ۲. *[کنایه، پلار]* ڕیایی و زمان‌لووسی ‹گه‌دا بێ یاخۆ پاشا بی، هه‌ر ئه‌مری/ ئیتر کلکه‌له‌قێ بۆچی له دیوان؟! «قانع»› ≡ ۱. عمل دُم جنباندن سگ برای اظهار وفاداری ۲. تملُق

**کلکه‌مار / kilkemar/**: ناوه‌ڵناو. *[مه‌جاز]* زۆر تاڵ له چێژدا ≡ بسیار تلخ

⊡ **کلکه‌مار کردن**: *[پلار]* ژه‌قنه‌مووت کردن؛ خواردنی به ناڕه‌حه‌تییه‌وه ≡ کوفت کردن

**کلکه‌مو / kilkemû/**: ناو. شیرماسی؛ شمشێرماسی ≡ شمشیرماهی

**کلکه‌نما / kilken(i)ma/**: ناوه‌ڵناو. تایبه‌تمه‌ندی شتێ که بۆ باشی یان خراپی ئاشیره‌تی بۆ بکرێ ≡ انگشت‌نما

**کلکه‌نه‌فتینه / kilkeneftîne/**: ☜ **کتکه‌نه‌فتینه**

**کلکه‌وانه / kilkewane/**: ناو. کلوانک: ۱. ئه‌نگوستیله ۲. کێلکه‌وانه؛ قووچه‌که‌ی درووماں ≡ ۱. انگُشتری ۲. انگُشتانه

**کلکهه‌ڵته‌کێنه / kilkheļtekêne/**: ناو. کلک‌ته‌قنه؛ کلک‌ته‌قێنه؛ گاچه‌ڕێنک؛ گاچێرین؛ گاویلکه؛ به‌رگاویله؛ گایلکه؛ به‌رگایلکه ≡ دُم‌جُنبانک

**کلل / k(i)lil/**: ناوه‌ڵناو. ۱. سپی خاڵدار (ماین و ئه‌سپ) ۲. سپیلک؛ ڕه‌شباز؛ ئه‌بڵه‌ق (ئه‌سپ) ۳. سپات؛ سپی‌واش؛ به ڕه‌نگی زه‌ردی ئاماڵ سپی ≡ ۱. سفید خالدار (اسب) ۲. ابلق (اسب) ۳. کِرِم رنگ

**کللۆ / killo/**: ناوه‌ڵناو. ۱. چیل؛ سپی و ڕه‌ش (گا) ۲. ☜ **کوله‌۱** ۳. سپی به خاڵی ڕه‌شه‌وه (جانه‌وه‌ر) ≡ ۱. سفید و سیاه (گاو) ۲. ☜ **کوله‌۱** ۳. سفید دارای خال‌های سیاه (جانور)

**کللی**[1] / /killî/: ناو. ۱. سپات؛ ڕەنگی زەردی ئامـاڵ سپی ۲. گڕی ئاگر ≡ ۱. رنگِ کِرِم ۲. زبانەی آتش

**کللی**[2]: ئاوەڵناو. ۱. سپات ۲. سپی خاڵدار ≡ ۱. کِرِم رنگ ۲. سفید خالدار

**کلم** / /kilm/: ئاوەڵناو. کورت؛ قوت؛ کن؛ کوڵ؛ کۆتا ≡ کوتاه

**کلمساندن** / /kilm(i)sandin/: چـاوگ. سەرسـام کردن ≡ مات و مُتحیّر کردن

**کلمسین** / /kilm(i)sîn/: چاوگ. سەرسـام بـوون ≡ مات و مُتحیّر شدن

**کلمش** / /kilmiş/: ناو. ۱. ڕیپۆقی چاو ۲. چڵکی ناو گوێ ≡ ۱. ژفک چشم ۲. چرک گوش

**کلموچ** / /kilmûç/: ناو. کلمیچ؛ کلمووش؛ کلمیش؛ کەمێڵەی لووت ≡ خُلم

**کلمۆ** / /kilmo/: ئاوەڵناو. کورتەباڵا؛ بـەژن کـنـک ≡ کوتاه قد

**کلمووش** / /kilmûş/: ☜ **کلموچ**

**کلمەی** / /kilmey/: چاوگ. کـورت کـردن؛ قـوت کردن ≡ کوتاه کردن

**کلمیچ** / /kilmîç/: ☜ **کلموچ**

**کلمیش** / /kilmîş/: ☜ **کلموچ**

**کلمیشۆک** / /kilmîşok/: ئاوەڵناو. چڵـمن؛ لـووت بـە چڵمەوە ≡ خلمو

**کلوا** / /kilwa/: ناو. سکڵ؛ پەنگریِ سۆر؛ پۆلووی بە گەشە ≡ اخگر

**کلوانک** / /kilwanik/: ☜ **کلکەوانە**

**کلوچە** / /k(i)luçe/: ☜ **کولیچە**

**کلوز** / /k(i)luz/: ناو. گوڵـەگـەنمی هەڵـبرووزاو ≡ خوشه گندم نیم سوخته

**کلومنجڕ** / /k(i)luminciř/: ئاوەڵـناو. ڕێـک یـەک نـا ‹ماڵـمان وەرانـوەر یـەکن، وەلـێ قاپییـەکان کـەمێ کلومنجڕن› ≡ غیر روبرو

**کلۆ** / /k(i)lo/: ☜ **کولە ـ۱**

**کلۆج** / /k(i)loc/: ☜ **کولۆج**

**کلـۆچ** / /k(i)loç/: نـاو. ۱. ☜ **کولیچـە** ۲. قـۆچ؛ شاخی جانەوەر ≡ ۱. ☜ **کولیچە** ۲. شاخ جانور

**کلـۆخ** / /k(i)lox/: نـاو. ۱. قـەحفی سـەر ۲. سـەر؛ یەکەی ئاژەڵ بژاردن ۳. ☜ **کلیخ** ≡ ۱. کاسـەی سر ۲. رأس؛ واحد شُمارش دام ۳. ☜ **کلیخ**

**کلۆر** / /k(i)lor/: ئاوەڵناو. ۱. کوللۆر؛ ناوبەتاڵ؛ پووک ‹ئێژن: ئاخۆ دەمانگێڕنەوە سەر زەمین؟ لە پاش ئـەوە کە چەند پێشەیێ کلۆر بووین؟ «هەژار، *قورئان*»› ۲. خڕ؛ خرت ≡ ۱. کاواک؛ میان‌تهی ۲. گِرد

⊡ **کلۆر کردنـەوە:** خڕ کردنەوە؛ کۆ کردنەوە ‹خـۆی کلۆرکرد و بە تل تا خوار چوو!› ≡ گِرد کردن

**کلۆرایی** / /k(i)lorayî/: ☜ **کلۆری**

**کلۆری** / /k(i)lorî/: ناو. کلۆرایی؛ بۆشـایی؛ کـون یـا چاڵایی نێو شتێک ≡ حُفره

**کلـۆز** / /k(i)loz/: ناو. سارستە؛ ڕسـتەتا؛ ڕستەئاسـا؛ ڕستەیەکی بەبێ کـردار کـە نیشـانەی دۆخێکـی عاتیفی وەک ئافـەرین، سەرسـووڕمان، شـادی و داخ و... (وەک: خۆزگە، داخەکەم؛ حەیفی و...) ≡ شبه جمله

**کلۆشک** / /k(i)loşk/: نـاو. کێلەکا ڕێکێ؛ نیشـان لـە ڕێگەدا ≡ نشان‌های راهنما در مسیر راه

**کلۆف** / /k(i)lof/: ئاوەڵناو. مچۆڵە؛ مچوڵە؛ مێچۆڵـە؛ مێچۆڵکە؛ کلۆف؛ گلۆف؛ گولۆف؛ گلفـچ؛ قـرمچ؛ لۆچ و پۆچ؛ تایبەتمەندی ئەوەی لـە بـەر تـەوژم، بیچمی تێکچووە و خڕ بۆتـەوە و چۆتـە یـەک ≡ مُچاله

**کلۆفت** / /k(i)loft/: ☜ **کلفت**

**کلۆن** / /k(i)lon/: ئاوەڵناو. چلۆن؛ چلۆن؛ چۆن؛ چاوا؛ کوو ≡ چگونه

**کلـو** / /k(i)lû/: نـاو. ۱. کولـوو؛ دەنکـی بـەفر ۲. پێچراوی خوری و لۆکەی خاو ۳. بـەرگی ڕێـزی دەنک لە بەری گیادا ≡ ۱. دانـەی بـرف ۲. آغنـد؛

الیاف پشم و پنبه ۳. نیامک هسته‌ی گیاه

**کلوج** / k(i)lûc/: ☜ **کولۆج**

**کلوس** / k(i)lûs/: ناو. کووپە؛ دەفری سواڵەتی هەراو ☰ خُم

**کلوسک** / k(i)lûsik/: ناو. بستووگە؛ کووپەڵە؛ کەدینگ؛ دەفری سەر ئاواڵەی چکۆڵە ☰ خُمچە؛ خُم کوچک

**کلو-کلو** / k(i)lû k(i)lû/: ناوەڵکار. دانە ـ دانە ‹کلوو ـ کلوو دینە خواری سپی و جوان/ دەنکەدەنکەش با ئەیهێنێ بۆ هەیوان «گۆران»› ☰ دانه ـ دانه

**کله** / k(i)le/: ناو. ۱. تین و هاڵاو ۲. گڕی ئاگر ۳. سووتەمەنی ☰ ۱. هُرم ۲. لهیب آتش ۳. سوخت

**کله پێچ** / k(i)lepêç/: ناو. کارپووچ؛ خشتی کاڵ ☰ خشت خام

**کلەر** / k(i)ler/: ناو. ۱. کولین؛ جێگەی ئازووقە ۲. موبەق؛ مدبەق ☰ ۱. انبار آذوقه ۲. مطبخ

**کلەسوبحانی** / k(i)lesubĥanî/: ناو. کلێسمان؛ چاکترین جۆری کل ☰ بهترین نوع سُرمه

**کلهاییش** / kilhayîş/: ☜ **کۆکین**

**کلی** / k(i)lî/: ئاوەڵناو. سورمەیی؛ بە ڕەنگی سورمە ☰ سُرمه‌ای رنگ

**کلیپس** / k(i)lîps/: ناو. قژگیرە؛ خشڵێکە ژنان قژی پێ کۆ دەکەنەوە ☰ کلیپس

**کلیت** / k(i)lît/: ناو. ۱. کلیل؛ کلێل؛ هاچەر ۲. قفل؛ گۆڵە ۳. ئاڵقەڕێزی درگا کە قفلی پێدا دەکرێ ☰ ۱. کلید ۲. قُفل ۳. حلقه‌ی در که قفل را در آن کنند

**کلیته** / k(i)lîte/: ناو. قەلانەدۆش؛ قەلادووشان؛ نێوان شان و پیل ☰ کوله؛ قلمدوش

**کلیچ** / k(i)lîç/: ☜ **کولیچە**

**کلیچک** / k(i)lîçik/: ناو. قامکەتووتە؛ تلیاگچکە؛ ئەنگوسە تووتەڵە ☰ انگشت خنصر

**کلیچە** / k(i)lîçe/: ☜ **کولیچە**

**کلیخ** / k(i)lîx/: ناو. کلۆخ؛ دەمی تیغ و ئامرازی برین ☰ لب تیغ

**کلید** / k(i)lîd/: ناو. کلیل؛ کلێل؛ کلیت ☰ کلید

**کلیده** / k(i)lîde/: ئاوەڵناو. لە هەموو لاوە دەورەدراو ‹ولاتانی کلیدە لە نێو وشکایی، دەریایان نییە› ☰ محصور

**کلیر** / k(i)lîr/: ☜ **کلر**

**کلیزی** / k(i)lîzî/: ناو. لیکاوی دەم ☰ لعاب دهان

**کلیژ** / k(i)lîj/: ☜ **کلێجە**

**کلیسا** / k(i)lîsa/: ☜ **کڵێسە**

**کلیشه** / k(i)lîşe/: ناو. ۱. پارچە کانزایەک لە ئالیاژی ڕۆح کە وێنە یان نووسراوەیەک اپ، لە سەری بەرز بۆتەوە ۲. *[مەجاز]* وێنەی چاپی ☰ ۱و۲. کلیشه

**کلیل**[1] / k(i)lîl/: ناو. ۱. کلێل؛ کلید؛ کلیت؛ ئاچەر؛ شتێ کە قفڵ بکاتەوە ۲. قفڵ؛ قولف؛ گۆڵە؛ کۆج ☰ ۱. کلید ۲. قُفل

▣ **کلیل دان**: قفڵدان؛ داخستن بە قفڵ و کلیل ☰ قُفل کردن

**کلیل**[2]: ئاوەڵناو. لێکهاڵاو؛ شپرز و شێواو (مووی سەر) ☰ ژولیده (مو)

**کلیل‌بەبەرۆک** / k(i)lîlbeberok/: ناو. *[کینایە]* کچی عازەو ☰ دختر دم بخت

**کلیل‌بەدەست** / k(i)lîlbedest/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* خاوەن دەسەلات ☰ همه‌کاره

**کلیل‌ساز** / k(i)lîlsaz/: ناو. قولفساز؛ قفڵساز ☰ قفل‌ساز

**کلیلک** / k(i)lîlik/: ناو. کلیلی دارینی کلیلە و گۆڵە ☰ کلید چوبین

▣ **کلیلکا مل**: چۆڵەمە؛ چەڵەمە ☰ جناغ سینه

**کلیل‌وکۆم** / k(i)lîl û kom/: ناو. کلیل‌وگۆڵ؛ کلیل‌وگۆڵە؛ کلێل‌وکۆم؛ قفلی دارینی درگا ☰

قفل چوبین در

**کلیل‌وگۆڵ** / k(i)lîl û goł/: ☜ **کلیل‌وکۆم**

**کلیل‌وگۆڵه** / k(i)lîl û gołe/: ☜ **کلیل‌وکۆم**

**کلیله** / k(i)lîle/: ناو. کلێله: ١. ڕنووو؛ ڕنی؛ هەرەس ٢. کۆی بەفرێ کە با هێناویە ☰ ١. بهمن ٢. تودەی برفی که باد انباشته

**کلیله‌بەفر** / k(i)lîlebefr/: ناو. باپزوو؛ ڕنوو؛ ئەو بەفرە کە با دەیمالێ و لە لاپالان سووانەی پێ دەکا ☰ برف گردآمده از باد

**کلیم** / k(i)lîm/: ناو. بەڕە؛ سیپاڵ؛ ڕایەخی تەنک و کەم‌بایی ☰ گلیم

**کلێپ** / k(i)lêp/: ناو. کار و ڕەوتی ئامادە کردن و دابێژتنی خاک بۆ قوڕ گرتنەوە ☰ آماده کردن خاک برای تهیه‌ی گِل

**کلێته** / k(i)lête/: ناو. سەرکڵاوەی بەن ☰ کلوتە؛ نوعی کلاه پشمی

**کلێچه** / k(i)lêce/: ناو. کلێنجە؛ کلێنچک؛ کلێنچکە؛ کلیژ؛ قلێچکە ☰ دُنبالچه

**کلێچه** / k(i)lêçe/: ☜ **کولیچه**

**کلێسمان** / k(i)lêsman/: ☜ **کله‌سوبحانی**

**کلێڵ** / k(i)lêł/: ناو. کرێڵ؛ کلیل؛ هاچەر ☰ کلید

**کلێنجه** / k(i)lênce/: ☜ **کلێچه**

**کلێنچک** / k(i)lênçik/: ☜ **کلێچه**

**کلێنچکه** / k(i)lênç(i)ke/: ☜ **کلێچه**

**کلێنچه** / k(i)lênçe/: ناو. تەری؛ جوچکە سمت؛ ئێسکی قوونێ ☰ دُنبالچه

**کلێنه** / k(i)lêne/: ناو. گاینە؛ گادانە؛ گاودانە ☰ گاودانه

**کڵ** / kił/: ناو. ١. سورمە؛ کل ٢. جێگەی سواڵەت تێدا سوور کردنەوە ٣. پایەی پرد ٤. کڵپە؛ بڵێسەی ئاگر ☰ ١. سُرمه ٢. داش؛ کورەی سُفال‌پزی ٣. پایەی پُل ۴. زبانەی آتش

⊡ **لە کڵ دەرهاتن/ هاتنەدەر:** *[کینایە]* سارد و گەرمی ڕۆژگار چەشتن و پێ ڕاهاتن ‹باوک بۆ هیچ کەسێ نامێنێ تا سەر/ کوڕ ئەو کوڕەیە لە کڵ بێتە دەر «قانع»› ☰ آبدیده شدن

**کڵاژدم** / k(i)łajdim/: ناو. کڵاشدم؛ کولاژدم؛ دووپشک ☰ عقرب

**کڵاش** / k(i)łaş/: ناو. ١. خارش؛ خوروو ٢. کەلاش؛ کەلاشە؛ کالووش؛ جۆرێک پێڵاوی دەسچنی ناوچەی هەورامانە، لە دەزووی سپی دەچنرێت و بە تەختە پەڕۆی لۆ ـ لۆ لە سەر یەک گووشراو، بنەکەی دەگرن ☰ ١. خارش ٢. کلاش

⊡ **جواو کڵاش وە پا نەدانەوە:** *[کینایە]* زۆر لووتبەرز و بەفیز و دەمار بوون ☰ پُرمُدّعا و مُتکبر بودن

**کڵاشته** / k(i)łaşte/: ناو. کاری خوراندن؛ بە نینۆک کراندنی پێست ☰ عمل خاراندن

**کڵاشته‌ی** / k(i)łaştey/: چاوگ. خوراندن؛ خورانن ☰ خاراندن

**کڵاشچن** / k(i)łaşçin/: ناو. کەلاشچن؛ ئەو کەسەی سەری کڵاش بە بەن دەچنێ ☰ بافنده‌ی کلاش

**کڵاشدروو** / k(i)łaşd(i)rû/: ناو. کڵاشکەر؛ کەسێ کڵاش چێ دەکا ☰ کلاش‌دوز

**کڵاشدم** / k(i)łaşdim/: ☜ **کڵاژدم**

**کڵاش ـ کڵاش** / k(i)łaş k(i)łaş/: ناو. ناوی یارییەکی لاوانی گوندنشینە ☰ از بازی‌ها

**کڵاشکەر** / k(i)łaşker/: ☜ **کڵاشدروو**

**کڵاشه** / k(i)łaşe/: ناو. ١. خوروو؛ خارشت ٢. هەندێکی لە ئەندازە بەدەر ☰ ١. خارش ٢. مقدارِ بیش از اندازه

⊡ **کڵاشه کردن:** کەلاشە کردن: ١. زۆر بوونی قوڕ لە زەویدا ٢. *[کینایە]* زۆر بوون و لەبەر زۆری، بێ‌بایەخ بوونی شتێ لە شوێنێکدا ‹لە ژێر ئەو دارانە هەڵووچە کڵاشە ئەکا› ☰ ١. فراوان بودن گِل در زمین ٢. فراوان بودن و به دلیل وفور، کم

ارزش شدن چیزی در جایی

**کلاشیای** / k(i)łaşyay/: چاوگ. خوران؛ خوریان ≡ خاریدن

**کلاشین** / k(i)łaşîn/: چاوگ. خوراندن ≡ خاراندن

**کلاف** / k(i)łaf/: ناو. کلافە؛ کەلەف؛ کەلاف؛ کەلافە؛ کلف؛ پار؛ بەن یان شریتی لە دەوری جەغزێک پێچراو و لە ناوقەدەوە بەسراو ≡ کلاف نخ

**کلافە**[1] / k(i)łafe/: ناو. ١. خەرەک؛ لۆتەر؛ لەتەری ٢. پەتێکی بە ئالقەیە هەر دوو جومگە دەستی ئەسپی پێ دەبەستن بۆ ڕاهێنانی ڕۆیشتنی خۆش ٣. یەکەی ژماردن و هەڵگرتنی بەن ‹دوو کلافە دەزووم دەوێ› ٤. چوارچێوەی باریک ٥. کرێوە؛ بادەوە ≡ ١. دوک نخ ریسی ٢. ریسمانی کە در تربیت اسب بە کار می‌رود ٣. کلاف نخ ٤. چهارچوب نازک ٥. کولاک

**کلافە**[2]: ناوەڵناو. وەڕەز؛ بێ‌تاقەت؛ بێ‌ئۆقرە و هەدا ≡ کلافە

**کلافەگر** / k(i)łafegir/: ناو. پارگیر؛ پارکەر؛ تەختەیەکە سێ قوچکەی تێبڕاوە، کەلافی دەزووی لە سەر هەڵدەکەن ≡ کلافەگیر

**کلافەهەڵکەر** / k(i)łafehełker/: ناو. دارێکی بە چەنگە دەسووڕێ و دەزووی خەرەک لە خۆی دەهاڵێنێ ≡ کلاف‌پیچ

**کلانە** / k(i)łane/: ناو. ١. مووروو؛ موورگ ٢. قۆپچە؛ دوگمە ≡ ١. مُهره ٢. تُکمه

**کلاو** / k(i)ław/: ناو. ١. کور؛ کولەه؛ کولاو؛ کولاوە؛ کۆلار؛ کووم؛ کوم؛ کۆم؛ کوومک؛ کووتۆز؛ کولاف؛ کولۆز؛ تەپلە؛ پۆشەنێ کە دەکرێتە سەر و زۆرتریش لێوار و دەورەی هەیە ٢. ترۆپکی چیا؛ دوندی کێو ‹تای چین چنوور، پای تاف بەفراو/ هەر وە تۆ مەکەفت نە دەورەی کلاو «مەولەوی»› ≡ ١. کُلاه ٢. قُلەی کوه

⊡ **کلاو تێکگیران**: ☜ **کلاو تێکەڵ بوون**

**کلاو تێکەڵ بوون**: *[کینایە]* کلاو تێک گیران؛ تووشی شەڕ بوون ≡ کلاه (کسی با دیگری) توی هم رفتن

**کلاو چوونە سەر کەسێ**: *[کینایە]* فریو خواردن ≡ کلاه سر کسی رفتن

**کلاو کردنە سەر کەسێ**: ☜ **کلاو نانە سەر کەسێ**

**کلاو نانە سەر کەسێ**: *[کینایە]* کلاو کردنە سەر کەسێ؛ کەسێ فریو دان؛ کەسێ هەڵخەڵەتاندن ≡ کلاه سر کسی گذاشتن

**کلاوی مەلوێ کردنە سەر جەلوێ**: *[کینایە]* کلاوی کەسێک نانە سەر یەکێکی‌تر؛ سەت سەری بێ دەلاک تاشین؛ بە فریو دانی خەڵک یان بە گرتنی شتێک لە کەسێ و دانی بە دیتری گرفتی خۆ چارەسەر کردن ≡ کلاه کسی را سر دیگری گذاشتن

**دەس بە کلاوی خۆوە گرتن**: *[کینایە]* لە بەرانبەر مەترسیدا ئاگاداری خۆ بوون و کار بە کەسی ترەوە نەبوون ‹کێوان دەسیان بە کلاوی لووتکەوە گرتبوو/ هەتا بەعسی نەیفڕێنێ! «شێرکۆ»› ≡ کلاه خود را دودستی چسبیدن

**شتێک لە ژێر کلاوی کەسێکدا بوون**: *[کینایە]* کارێ بە دەستی کەسێکەوە بوون؛ بەرنامەیەک لە ژێر سەردا بوون؛ مەبەستێک لە دڵدا بوون ≡ چیزی در سر داشتن

**کلاوئاڵتوون** / k(i)ław'ałtûn/: ناو. کلاوێ کە لە سکە زێڕی پێکەوەلکاو دروست دەکرێ ≡ کُلاه ساختە شدە از سکەهای طلا، کە زیوری است زنانە

**کلاوبن** / k(i)ławbin/: ☜ **کلاوبنە**

**کلاوبنە** / k(i)ławb(i)ne/: ناو. کلاوبن؛ قالاقنگ؛ ڕێکلاو؛ لاسکی گەڵای ڕێواس ≡ ساقەی برگ ریواس

**کلاوبۆرکە** / k(i)ławborke/: ☜ **کلاوبۆرە**

**کڵاوبۆره** / k(i)ławbore/: ناو. کلاوبۆرکە؛ کـلاوی لە بەرگن ☰ کلاه نمدی

**کڵاوبەدەورێن** / k(i)ławbedewrên/: نـاو. جۆرێـک یاری مندالانە بە کلاو ☰ کُلاەبازی کودکانە

**کڵاوچن** / k(i)ławçin/: ناو. ئەو کەسـەی کـلاو بـە دەزوو دەتەنێ ☰ بافندەی کلاه

**کڵاوچی** / k(i)ławçî/: ناوەلـناو. [کنایە] کلاوسـاز؛ فێلباز؛ گزیکار ☰ کلاهبردار

**کڵاوخود** / k(i)ławxûd/: ناو. کلاوزرێ؛ کـوومزرخ؛ تاسکڵاو؛ خوود؛ کلاوی وەک کاسەیەکی کانزایی بۆ بەرگری لە گەزن دیتنی سەر، کە لە شەڕدا لە سەری دەکەن ☰ کلاهخود

**کڵاوخەو** / k(i)ławxew/: نـاو. شەوکلاو؛ کلاوێکـی پتر نەرمچن و بێلێوارە کە لە مـاڵ یـان شـەوانە کاتی نووستن دەیکەنە سەر ☰ شبکُلاه

**کڵاودار** / k(i)ławdar/: ناو. باڵداری سەر بە پۆپەی لە پەڕ ☰ شانەبەسر

**کڵاودرو** / k(i)ławd(i)rû/: ناو. کەسێ کە کلاو بـۆ فرۆشتن دەدروێ ☰ کلاهدوز

**کڵاوڕۆچنـە** / k(i)ławřoçne/: نـاو. کلاوڕۆژنـــە؛ کـــولان؛ کولانجـــە؛ کولاوانجـــە؛ کولاوەنجـــە؛ کولاوکـــە؛ کولینـــک؛ کولانکـــەبان؛ کولاوڕۆچنـــە؛ کولاوڕۆژنـــە؛ کوناوەجگـــە؛ کوناوەجـــە؛ بانجـــە؛ ڕۆچنەی سەربان ☰ روزنەی بام

**کڵاوڕۆژنە** / k(i)ławřojne/: ☜ **کلاوڕۆچنە**

**کـڵاوڕەش** / k(i)ławřeş/: نـاو. ١. نەخۆشـــییەکی تایبەتی بزنە ٢. [کنایە] ئێرانی ☰ ١. از بیماری‌های ویژەی بُز ٢. ایرانی

**کڵاوڕەشـە** / k(i)ławřeşe/: نـاو. جێگـەی سـەری چەلاک لە ڕەشمالدا ☰ جای سر ستون در سیاه چادر

**کـــڵاوزرە** / k(i)ławz(i)re/: نـــاو. برنجـــداس؛ برینجداس؛ گیایەکی گوڵزەردە بۆ دەرمـانی دڵ بەکەڵکە ☰ برنجاسف

**کڵاوزرێ** / k(i)ławz(i)rê/: ☜ **کلاوخود**

**کڵاوزەڕ** / k(i)ławzeř/: ☜ **کلاوزێڕ**

**کڵاوزێڕ** / k(i)ławzêř/: ناو. کلاوزەڕ؛ کلاو ئاڵـتوون ☰ کلاه زرّین

**کڵاوساز** / k(i)ławsaz/: ☜ **کلاوچی**

**کڵاوسـوور** / k(i)ławsûr/: نـاو. ١. کلاوەســـــوورە؛ گیایەکە بنـک سـوور بـۆ ئـاش دەبـێ ٢. [کنایە] ترکی عوسمانی ☰ ١. گیاهی آشی ٢. تُرک عثمانی

**کڵاوفڕێنە** / k(i)ławf(i)řêne/: ناو. یارییەکی لاوانە ☰ از بازی‌های جوانان

**کڵاوفەرەنگ** / k(i)ławfereng/: ☜ **کلاوفەرەنگی ٢ـ**

**کڵاوفــــەرەنگی** / k(i)ławferengî/: نـــــاو. ١. قوتکەیەکـە بـە سـەر بۆریـە سـۆبەدا دەکـرێ، دووکـــەڵ نەگەڕێنێتـــەوە ٢. کلاوفـــەرەنگ؛ نەخشێکە لە فەرشدا ☰ ١. کُلاهک بـالای لولـەی بخاری ٢. نقشی در قالی

**کڵاوقـازی** / k(i)ławqazî/: نـاو. هەزارلایـەی نـاو ورگ ☰ هزارلای شکمبە

**کڵاوقـژ** / k(i)ławqij/: نـاو. مووچـاچ؛ مووچـاخ؛ پرچـی بـەدەڵ؛ پرچـی دەسـکار؛ پۆشـەنێکی دەسکرد لە قژی بڕدراو کە بـۆ داپۆشـانی تاسـی یان گۆڕانی چار لە سەر دەکرێت ☰ کلاهگیس

**کڵاوقۆری** / k(i)ławqorî/: ناو. کلاوی لـە پووشـی لێـودار بـۆ دروێنـەوانان ☰ کـلاه حصیری لبـەدار دروگران

**کڵاوقـوچ** / k(i)ławqûç/: نـاو. قـــینا؛ کومـــک؛ شەوکلاو ☰ کلاه شب

**کڵاوکلاوێن** / k(i)ławk(i)ławên/: ☜ **کلاوێن**

**کڵاوکوڕە** / k(i)ławkuře/: ☜ **کلاونە**

**کڵاوکووڕە** / k(i)ławkûře/: ☜ **کلاونە**

**کڵاوگەڕە** / k(i)ławgeře/: ناو. کلاوی لێواردار لـە

بەرگنی پەستواو ☰ کلاه نمدی لبەدار

**کلاولار / k(i)ławlar/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ناڕاست؛ فێڵباز ☰ حیلەگر

**کلاونە / k(i)ławne/**: ناو. کلاوکورە؛ کلاوکوورە؛ تیتی؛ چۆڕەپۆپنەکی ☰ چکاوک کاکلی

**کلاوە / k(i)ławe/**: ناو. ١. پۆپەی لە پەڕی باڵدار ٢. کلاو؛ ترۆپکی چیا ٣. لاسکە گەنمەشامی کە دانی نەگرتبێ ٤. دیواری قوڕی لە دەوری دەمی دۆلاش بلندکراو ٥. بەشێکی کلاوئاسا لە سەر نووچکەی ئامێرێک ٦. سەلکی گیا ٧. دەنکی درشتی بەفر ٨. ☜ **کەڵەوە** ☰ ١. شانەی سر پرندە ٢. قلەی کوه ٣. بلال دانە نگرفتە ۴. دیوارک پیرامون دهانەی ناو آسیاب ۵. کُلاهک ۶ پیاز گیاه ۷. دانەی درشت برف ۸ ☜ **کەڵەوە**

▣ **کلاوی سەر چنگان**: یارییەکی لاوانە ☰ از بازی‌های جوانان

⊡ **کلاوە کردن**: بارینی بەفری دەنک درشت ☰ باریدن برف درشت

**کلاوبەڕوو / k(i)ławebeřû/**: ناو. جەوت؛ جفت؛ جووتی بەڕوو ☰ جُفت بلوط

**کلاوسورە / k(i)ławesûre/**: ☜ **کلاوسور-١**

**کلاوێن / k(i)ławên/**: ناو. کلاوکلاوێن؛ یارییەکی شەونشینییە ☰ نوعی بازی شبانە

**کلپە[1] / kiłpe/**: ناو. بڵێسەی ئاگر ‹سەبای هەناسەم نە دەروون سەد تەرز/ کەردەن کلپەی نار ئیبراهیمی بەرز «مەولەوی»› ☰ شعلەی آتش

⊡ **کلپە سەندن**: زۆر بوونی گڕی ئاگر ☰ شعلەور شدن

**کلپە کردن**: ١. داگیرسان؛ گڕ گرتن ٢. دەنگی گڕ بەرزەوە بوون ☰ ١. مُشتعل شدن ٢. صدای اشتعال پخش شدن

**کلپە[2]**: دەنگەناو. دەنگی بڵێسەی ئاگر ☰ صدای آتش مُشتعل

**کلپەکلپ / kiłpêkiłp/**: دەنگەناو. دەنگ و حاڵەتی دوولەدووی یەکی ئاگر کاتێ گڕی بەرز دەبێتەوە ☰ صدای شعلەی آتش

**کلپێچک / kiłpêç(i)k/**: ناو. قۆنداخ؛ قومات؛ بابۆلەی زارۆ تێ‌پێچان ☰ قُنداق نوزاد

**کلجە / kiłce/**: ☜ **کوڵەنجە**

**کلدان / kiłdan/**: ☜ **کلدان**

**کلف / kiłf/**: ☜ **کلاف**

**کلفت / k(i)łift/**: ئاوەڵناو. کلۆفت؛ کولفت؛ کولۆفت: ١. ئەستوور ٢. *[کینایە]* زۆر؛ زیاد ‹پوولێ کلفتی ها بە لاوە› ✱ هەروەها: **کلفتی** ☰ ١. ستبر؛ کُلُفت ٢. زیاد

**کلفەت / kiłfet/**: ناو. کولفەت: ١. ئەستووری ٢. خێزانی ماڵ ٣. قەرمواش ☰ ١. ستبری ٢. عائلە ٣. کُلفت خانە

**کلفەتبار / kiłfetbar/**: ئاوەڵناو. کلفەتدار؛ خێزان‌دار ☰ عیالوار

**کلفەتدار / kiłfetdar/**: ئاوەڵناو. ١. ☜ **کلفەتبار** ٢. تایبەتەندی ماڵێ قەرەواشیان هەبێ ☰ ١. ☜ **کلفەتبار** ٢. کُلفتدار

**کلکە / kiłke/**: ناو. پرد؛ پر؛ پێل ☰ پل

**کلم / kiłm/**: ناو. چلم ☰ خُلم

**کلمن / kiłmin/**: ئاوەڵناو. *[ئاشیرین]* چلمن ☰ خلمو

**کلمیش / kiłmîş/**: ناو. ١. چلم ٢. ڕیپۆقی چاو ☰ ١. خلم ٢. ژفک

**کلناشک / kiłnaş(i)k/**: ناو. قانگەلاشک؛ قنگەلاشکە ☰ گیاه خُشک بادبردە

**کلۆلی / k(i)łołî/**: ناو. مووروز؛ بەدبەختی ☰ بدبختی

**کلۆ / k(i)ło/**: ناو. کولۆ؛ کەستەک؛ کەستک؛ کێستەک؛ کەرسەک؛ کۆمای پێکەوە لکاوی هەر شتێک (وەک: خاک، بەفر و...) ‹کلوی خاک؛ کلوی بەفر› ☰ گلولە

**کلۆت** / k(i)łot/: ناو. کولـۆت؛ کەلـۆت؛ کۆلـمت؛ کلۆک؛ کەلۆک؛ کولـۆک؛ کلـۆمت؛ کولـەک: ١. جومگـەی ئێسـکی ڕان و دیزەلـەی سمـت ٢. یەکێک لە سێ ئێسکی سمت کە لەگەڵ ئێسکی کەلەکە و شەرمدا چـاڵایی جومگـەی ڕان پێـک دێنن ٣. سمتی یەکسم ≡ ١. مفصـل ران و لگـن ٢. استخوان نشیمنگاهی ٣. کفل چهارپا

**کلۆج** / k(i)łoc/: ☜ **کوڵەنجە**

**کلۆر** / k(i)łor/: ☜ **کلۆڵ**

**کلۆز** / k(i)łoz/: ☜ **کلۆس**

**کلۆس** / k(i)łos/: ناو. کلـۆز؛ کولـۆس؛ کۆلـۆس؛ کەلفیچ؛ کەلۆس؛ کەولۆس؛ کەلفس: ١. کەسێ کە ددانی پێشووی کـەوتووە ٢. کلاوبـۆرە ≡ ١. کسی که دندان پیشین ندارد ٢. کلاه نمدی

**کلۆش** / k(i)łoş/: ناو. کولۆش؛ کولـەش؛ کلۆشـە؛ کولۆشە؛ قرش؛ لاسکە دەغڵ ≡ کاهبُن

⊡ **کلۆش کوتان**: ورد کـردنی کلـۆش ‹لـە درەو نەجات نۆرەی خەرمانە/ گاگێرە بێنن کلۆش کوتانە «قانع»› ≡ خرمن کوفتن

**کلۆشە** / k(i)łoşe/: ☜ **کلۆش**

⊡ **کلۆشە بـوون**: گەیشـتنی دەخـڵ بـۆ درەو ≡ فرارسیدن موسم درو

**کلۆف** / k(i)łof/: ☜ **کلۆف**

**کلۆک**[1] / k(i)łok/: ☜ **کلۆت**

⊡ **کلۆک کوتیان**: [کینایە] ماندوو بوون و ئازار دیتنی زۆر ‹تا ئەو ماڵەم کردەوە کلۆکم کوتیا› ≡ خسته و درمانده شدن

**کلۆک**[2]: ئاوەڵناو. کولەک؛ تایبەتمەندی دانەوێڵـەیێ کە زوو لە ئاوی کوڵدا پێدەگا ≡ زودپخت (دانـەی حبوبات)

**کلۆگڵ** / k(i)łogił/: ناو. گلمت؛ مەدەر؛ کـولات ≡ کلوخ

**کلۆڵ** / k(i)łoł/: ئاوەڵـناو. کـرۆل؛ کلـۆر؛ کـورۆڵ؛ کولۆڵ؛ چارەڕەش. هەروەها: **کلۆڵـی** ≡ بـدبخت؛ سیەروز

**کلۆلاش** / k(i)łołaş/: ناو. گیایەکـە دەکرێتـە ددان ئاژن ≡ گیاه خلال دندان

**کلۆم** / k(i)łom/: ناو. کولۆم؛ کلۆن؛ قفڵی داریـنی درگا ≡ کلون

**کلۆمت** / k(i)łomit/: ☜ **کلۆت**

**کلۆن** / k(i)łon/: ☜ **کلۆم**

**کلۆنجە** / k(i)łonce/: ☜ **کوڵەنجە**

**کلووزنای** / k(i)łûznay/: ☜ **کرووزاندن**

**کلووزیای** / k(i)łûzyay/: ☜ **کرووزان**

**کلووک** / k(i)łûk/: ناو. کولـووک؛ شـکۆفەی دار ≡ شکوفەی درخت

**کلە** / k(i)łe/: ناو. ١. کل؛ سورمە ٢. کلی پـرد ≡ ١. سُرمە ٢. پایەی پل

**کلـەتۆرکێ** / k(i)łetorkê/: نـاو. سـێکوچکـەی ئاورکردنەوە ≡ سە سنگ اُجاق

**کلەدان** / k(i)łedan/: ☜ **کلدان**

**کلەشێر** / k(i)łeşêr/: ☜ **کەڵەشێر**

**کلەشـێرە** / k(i)łeşêre/: نـاو. خـرووزەک؛ خورووسەک ≡ خروسَک

**کلـەو** / k(i)łew/: نـاو. شـەپۆلێ کـە سـەر پـرد دەکەوێ ≡ موجی که روی پل سرریز کند

**کلێ** / k(i)łê/: ناو. کایە؛ جارێـک بـازی کـردن ≡ یک دور بازی

**کلێس** / k(i)łês/: ئاوەڵناو. تارومار؛ لە بەین چـوو ≡ تارومار

⊡ **کلێس بون**: بە تەواوی فەوتان ≡ تارومار شدن

**کلێسە** / k(i)łêse/: نـاو. کلیسـا؛ کەنیسـە؛ پەرستنگای مەسیحییان ≡ کلیسا

**کلێشە** / k(i)łêşe/: نـاو. ١. لەشـی مـرۆ ‹شـەیتان چۆتە کلێشەیەوە!› ٢. لەشی بێگیان ‹ئەی بـرای شیرین! یاری هاوفەردم/ کلێشەی وێنەی ڕەنگەکەی

زەردم «قانع»› ٣. بۆدڕنی لەش لە ئارەق و چڵک ☰ ١. تن آدمی ٢. تن بیجان ٣. بوی تند و زنندەی بدن

**کلێڵ** / k(i)łêł/: ناو. کلیل؛ هاچەر ☰ کلید

**کلێڵوکۆم** / k(i)łêł û kom/: ☜ **کلیلوکۆم**

**کلێڵە** / k(i)łêłe/: ناو. ١. ☜ **کلیلە** ٢. ڕەوتی وشک بوون و نەجوولانی جومگەی شەویلکە ☰ ١. ☜ **کلیلە** ٢. حالت قفل شدن فک

⊡ **دەم چوونە کلێڵەوە**: ١. شەویلکە قفڵ بوون ٢. *[کینایە]* لاڵوپاڵ بوون؛ قسە پێ نەمان ☰ ١. دهان قفل شدن ٢. مُندک شدن

**کم** / kim/: ☜ **کەم**[٢و٣]

**کماخ** / k(i)max/: ناو. کلۆت؛ سمت؛ کەفەڵ ☰ کفل

**کمان** / k(i)man/: ناو. پەرژین؛ چیل ☰ پرچین

**کمبەر** / kimber/: ناو. گوڵێکی بەهارییە ☰ از گل‌های بهاری

**کمت** / kimt/: ناو. ترۆپک؛ دوند؛ بەرزترین شوێن ☰ قُله؛ اوج

**کمکمە** / kimk(i)me/: ئاوەڵکار. کەمە ـ کەمە؛ نەختە ـ نەختە؛ وردە ـ وردە ☰ اندک ـ اندک؛ بە تدریج

**کمەک** / k(i)mek/: ☜ **کەمەك**

**کمێ** / k(i)mê/: ناو. دونبەلان؛ چمە ☰ دُنبلان

**کن**[١] / kin/: ناو. *[شووورەیی]* قن؛ قنگ؛ قوون: ١. سمت و کەفەڵ ٢. کونی پشتەوەی گیاندار ☰ ١. باسن ٢. مقعد؛ پیزی

**کن**[٢]: ئاوەڵناو. کوڵ؛ کۆتا؛ بەرانبەری درێژ ☰ کوتاه

**کن**[٣]: دەنگ. وشەی بانگ کردنی ژن بۆ خۆشەویستی ☰ کلمەی خطاب مهربانانەی زن

**کن**[٤]: ئامراز. لا؛ پاڵ؛ نک ‹وەرە کنی من بنوو› ☰ نزد

**کنا** / k(i)na/: ناو. ١. ☜ **کناچێ** ٢. قوڵ؛ کون؛ کونا ☰ ١. ☜ **کناچێ** ٢. سوراخ

**کناچانە** / k(i)naçane/: ☜ **کچانە**

**کناچڵەڕەنگ** / k(i)naçłeřeng/: ئاوەڵناو. بلەکناچێ؛ ژنانی؛ ژنانیلە؛ ژنەڕەنگە ☰ زن‌نما

**کناچە**[١] / k(i)naçe/: ☜ **کناچێ**

**کناچە**[٢]: دەنگەناو. دەنگی پۆڕ ‹ڕەنگ ڕەنگ پەپوولەی ئەفرێ زەلاوزەل/ گا کناچەی پۆڕ گا جریوەی مەل «گۆران»› ☰ صدای دُرّاج

**کناچەزا** / k(i)naçeza/: ☜ **کچەزا**

**کناچەی** / k(i)naçey/: ☜ **کچێتی**

**کناچێ** / k(i)naçê/: ناو. کناچە؛ کنا؛ کەنیشک؛ دۆت؛ قز؛ قژز؛ کچ ☰ دختر؛ دوشیزه

**کنار** / k(i)nar/: ناو. ١. داری نەبگ ٢. **کەنا**؛ کەنار؛ تەنیشت ☰ ١. درختی است ٢. **کنار**

**کناراو** / k(i)naraw/: ناو. **کەناراو؛ ئاودەست؛ مەباڵ** ☰ مُستراح

**کنارە** / k(i)nare/: ☜ **کەنارە**

**کناری** / k(i)narî/: ناو. دڕکەزی؛ دڕکێکە ☰ خاربُنی است

**کنارێن**[١] / k(i)narên/: ناو. بەستێن؛ کەنار؛ کەشار؛ سەر لێواری دەریا ☰ ساحل دریا

**کنارێن**[٢]: ئاوەڵناو. کونجگر؛ لاتەریک؛ گۆشەگیر؛ دوورەپەرێز لە خەڵک ☰ مُنزوی

**کنانیسک** / k(i)nanîsk/: ناو. قنگانیسک؛ ڕەقایی پشت ئانیشک ☰ قوزک آرنج

**کناوە** / k(i)nawe/: ئاوەڵناو. کنراوە؛ چنراو ‹خەیاری تازە کناوە› ☰ چیدەشدە؛ کندەشده

**کنتەنە** / kintene/: چاوگ. ١. لەش خوران ٢. لەش خوراندن ☰ ١. خاریدن بدن ٢. خاراندن بدن

**کنج**[١] / kinc/: ناو. ١. گنج؛ جلک و کەلوپەل ٢. کەوا؛ پارچە جلکی لە پشتێن بەرەژوور ٣. لای نێوان شت ☰ ١. رخت و لباس ٢. نیم‌تنه ٣. لایه

**کنج**[٢]: ئاوەڵناو. کرچ؛ کاڵ ☰ کال

**کنجڕ / kinciř/**: ناو. کنجک؛ پەڕۆکۆن؛ بزگوڕ ☰ کُهنەپارە

**کنجک / kincik/**: ☜ **کنجڕ**

**کند / kind/**: ناو. کن؛ قولە؛ بەرانبەری درێژ ☰ کوتاه

**کندر / kindir/**: ☜ **کەندیل**

**کندردڕک / kindird(i)řik/**: ناو. دڕکێکە ☰ خاربنی است

**کندرە / kind(i)re/**: ☜ **کەندیل**

**کندڕ / kindiř/**: ناو. کەندڕ؛ شوێنێ کە ئاو دایدڕیوە ☰ جای آب رُفته

**کندوش / kinduş/**: ناو. گوندوش؛ گندۆش؛ گونووش ☰ جوالدوز

**کندێلە / kindêle/**: ☜ **کەندیل**

**کنر / k(i)nir/**: ☜ **کەندیل**

**کنسا / kinsa/**: ناو. کاری خۆ بە دیوار خوراندن ☰ عمل خود را به دیوار ساییدن و خاراندن

**کنشت / k(i)nişt/**: ناو. ١. کاوێژ؛ قاویش ٢. پەرسگای جوولەکە ☰ ١. نشخوار ٢. کُنشت؛ معبد یهودیان

**کنف[1] / kinf/**: ناو. مێشەی پری دەس‌نێژ ☰ بیشەی انبوه

**کنف[2]**: ئاوەڵناو. لووس و لێک و لەبار ☰ شیک

**کنفت / k(i)nift//**: ئاوەڵناو. سەقەت؛ پەک‌کەوتە؛ بە هۆی شکانی ئەندام یان نەخۆشی ئەستەمەوە، لە جووڵە کەوتوو. هەروەها: **کنفتی** ☰ زمینگیر

**کنک / kink/**: ئاوەڵناو. کند؛ کن؛ قوڵ؛ قولە؛ کول؛ کورت؛ کۆتا؛ دژی درێژ. هەروەها: **کنکی** ☰ کوتاه

**کنگ / king/**: ناو. *[شوورەیی]* قنگ؛ کن؛ قن: ١. سمت و کەفەڵ ٢. کونی پشتەوەی گیاندار ☰ ١. باسن ٢. مقعد

◘ **کنگ دانەوە:** ڕۆنیشتنی بە ئامانەتی؛ تاوێک دانیشتن ☰ موقت نشستن

**کنگدەر / kingder/**: ناو. *[ئاشیرین]* بەپشت؛ قووندەر؛ خوزگ ☰ کونی

**کنگر / kingir/**: ☜ **کەنگەر**

**کنگەجنۆکە / kingec(i)noke/**: ناو. *[کینایە]* جێگای زۆر تەنگ و تەسک ☰ جای بسیار تنگ و کوچک

**کنگەخشکێ / kingexişkê/**: ☜ **قنگەخشکێ**

**کنگەخەو / kingexew/**: ناو. خەوی بە دانیشتنەوە ☰ عمل نشسته خوابیدن

**کنگەری / kingerî/**: ☜ **کەنگەر**

**کنگەگاز / kingegaz/**: ناو. برین لە پاشلی ئەسپ و بارەبەر ☰ زخم باسن اسب و دیگر چهارپایان

**کنگەوتلۆر / kingewt(i)lor/**: ئاوەڵکار. لە ڕاکشاندا؛ بە ڕاکشاوی ☰ درازکش

**کنۆڕک / k(i)nořik/**: ناو. ١. تێلەکە دڕک ٢. داری دوو لق بۆ دڕک گواستنەوە ☰ ١. پُشتەی خار ٢. چوب دو شاخه ویژەی جابجا کردن خار

**کنۆڕە / k(i)noře/**: ناو. کنۆڕک؛ داری دووفلیقانەی دڕک خڕ کردنەوە ☰ چوب دوشاخه برای جمع کردن خار

**کنۆژ / k(i)noj/**: ئاوەڵناو. کنۆس؛ ڕژد؛ چکووس؛ چکوود؛ دەس‌قووچاو ☰ خسیس

**کنۆس / k(i)nos/**: ☜ **کنۆژ**

**کنۆشە / k(i)noşe/**: ناو. گزگ؛ گەسک؛ گێزگ؛ گزی ☰ جارو

**کنووشک / k(i)nûşik/**: ناو. چێرەیی؛ ڕەنگی پەمەیی؛ سووری کاڵ ☰ صورتی

**کنە[1] / k(i)ne/**: ناو. ١. کاری زۆر و بەدەوام «ڕەنج و کنەی ڕۆژ و شەو/ کردەی تۆیە و بردەی ئەوا «کاکەی فەلاح»» ٢. کاری دانەوە و کەندنی زەوی ٣. کار و ڕەوتی تۆژینەوە ☰ ١. کار زیاد و پیوسته ٢. عمل کندن زمین ٣. کنکاش

◘ **کنە کردن:** کۆڵینەوە؛ تۆژینەوە ☰ جستجو کردن

**کنە[2]**: دەنگ. وشەی دواندنی کچ ☰ کلمەی خطاب

نوازش‌آمیز به دختر

**کنه**[۲]: ئامراز. کن؛ پاڵی ‹ئەتۆ لە کنە خـۆت تـورکی خوێنمژی/ بەدفەڕ شەڕانی ڕێگر پیاوکوژی «هێمن»› ☰ نزدِ؛ پیشِ

**کنەک / k(i)nek/**: ناو. خێشکی کلۆش کێشان بـۆ سەر خەرمان ☰ ابزار ساقه کشیدن سر خرمن

**کنەوە / k(i)newe/**: ناو. ۱. دۆخی پرووشە کـردن لە خواردن ۲. کاری کۆڵینەوە ۳. کۆششی زۆر لە کاردا ☰ ۱. بی‌میلی به خوراک ۲. کاوش ۳. کوشش؛ جهد

**کنی / k(i)nî/**: ئامراز. باڵ؛ پاڵ؛ پاڵی؛ پەنای ☰ بغلِ؛ کنارِ

**کنیانەوە / kinyanewe/**: چاوگ. دادڕان؛ داکنـران ☰ کنده شدن

**کنیای / kinyay/**: چاوگ. کەنران ☰ کنده شدن

**کنیـواڵ / k(i)nîwał/**: نـاو. کـوڕادە؛ سیرەقوڕاڵـە؛ سیرەقوڕۆڵـە؛ سـێقنـگ؛ گیایـەکی چیاییـە، ئەخورێ ☰ تره‌کوهی

**کنێر / k(i)nêr/**: ☜ **کەنێرە**

**کنێرۆک / k(i)nêrok/**: ☜ **کەنێرە**

**کنێرە / k(i)nêre/**: ☜ **کەنێرە ـ۱و۲**

**کـوا / k(i)wa/**: ئاوەڵکار/ سارستە. کوانێ؛ لە کوێیە بۆ پرسیار یان پلار بـۆ تـاک و کـۆ ‹کـار کـوا؟؛ کـوا کلیلەکەم؟› ☰ کو؛ کجاست

**کواتر / k(i)watir/**: ☜ **کۆتر**[۱]

**کوارگ / k(i)warg/**: ☜ **کارگـ۱**

**کوارە / k(i)ware/**: ناو. ۱. ☜ **کواڕـ۱** ۲. بـاجی ئاغا لە سەر هەنگوینی ڕایەت ☰ ۱. ☜ **کواڕـ۱** ۲. سهم ارباب از عسل رُعایا

**کواڕ / k(i)wař/**: ناو. ۱. کـوارە؛ دەفـری گـەورەی گڵـینی دەخـڵ و ئـارد ۲. پلـوورە هـەنگ ☰ ۱. کندوی غله ۲. کندوی زنبور عسل

**کواکـو / k(i)wakû/**: ئاوەڵـناو. زۆر؛ زیـاد؛ فـرە ☰ فراوان

**کوان**[۱] **/ k(i)wan/**: نـاو. ۱. کوڤان؛ دمـەڵ؛ دومـەڵ ۲. کونا؛ قول؛ کنا ☰ ۱. دُمل ۲. سوراخ

▣ **کوانی خورما**: دمەڵێکە لە دەم و چاو دێت و تـا ساڵێک چاک نابێتەوە ☰ سالک

**کوان**[۲]: ئاوەڵکار/ سارستە. لە کوێدان؛ بـۆ پرسـیار لـە جـێ و شـوێنی کـەس یـان شـتی بـە کۆمـەڵ ‹گۆرەوییەکانم کوان؟› ☰ کو؛ کجایند

**کواناکەش / k(i)wanakeş/**: ☜ **کۆڵەوەژ**

**کوانک / k(i)wanik/**: ☜ **کوانو**

**کوانگ / k(i)wanig/**: ☜ **کوانو**

**کوانـو / k(i)wanû/**: نـاو. کوانـک؛ کوانـگ؛ کوچک‌وکوانگ؛ **تفک**؛ **ئاگردان** ☰ **اُجاق (بـە ویـژە اجاق سنگی)**

**کوانێ / k(i)wanê/**: ☜ **کوا**

**کواو / k(i)waw/**: ☜ **کەباب**

**کوای / k(i)way/**: چاوگ. لێدان؛ **کوتان** ☰ **کوبیدن**

**کواییش / k(i)wayîş/**: چـاوگ. ۱. دارکاری کـردن ۲. نەقیزە تێ وەژانـدن ☰ ۱. چوبکـاری کـردن ۲. سیخونک زدن

**کوبار**[۱] **/ kubar/**: ناو. ۱. بەڕێز؛ مرۆی بەحورمـەت ۲. سەرەتای هەر شتێ لە بەر و بووی زەمـین ☰ ۱. آدم باوقار ۲. سرآغاز بهره دادن زمین

**کوبـار**[۲]: ئاوەڵـناو. کبـار؛ دەلال؛ زەریـف؛ جـوان؛ شیرین ‹کوبار و پرشرین› ☰ زیبا

**کوبـاری / kubarî/**: ناو. کوبار؛ نۆبەرە ☰ نوبر

**کوبـاڵت / kubałt/**: ناو. توخمی کیمیاوی کـانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ۲۷ و کێشی ئـەتومی ۵۸،۹۳، کە کانزایەکی میغناتیسـی بـە ڕەنگـی سـپییە و زۆرتر بۆ دروست کردنی ئالیاژ کەڵکی لێ دەگرن ☰ کُبالت

**کوپلخ / kuplix/**: ناو. سێ‌پایەی کووپە ئاو لە سەر دانان ☰ سه‌پایه‌ی خُم آب

**کوپی / kupî/:** ☜ **فوتۆکوپی**

**کوپیان**[1] **/ kupyan/:** ☜ **کوپین**

**کوپیان**[2]: ئاوەڵناو. هێدی؛ ئارام ﷼ آرام

**کوپین / kupîn/:** چاوگ. کوپیان؛ ئارام گرتن؛ هەدادان ﷼ آرام گرفتن

**کوت**[1] **/ kut/:** ناو. ١. پاژ؛ پارچە؛ تیکە ‹کوتێ لەو شووتییەم بدەرێ› ٢. قوت؛ کاری لێدان؛ قوتان ٣. *[شوورەیی]* حینچکە؛ پەیکوت؛ تەکان و شەکانی کاتی سەرجێیی ﷼ ١. قطعە؛ تکە ٢. عمل زدن ٣. کلە هنگام جماع

⊡ **کوت پێوەدان:** *[شوورەیی]* کوت دان؛ کوت لێدان؛ ژەنین؛ حینچکە لێدان ﷼ کلە زدن در جماع

**کوت دان:** ☜ **کوت پێوەدان**

**کوت کردن:** ١. پارچە کردن ٢. لەت کردن؛ قاژ کردنی میوە (بۆ خواردن یان وشک کردن) ‹دا پرتەقالێ کوت کە!؛ ئیمرۆ بارێک شێلانەمان لە مەشتاکە کوت کرد› ﷼ ١. قطعە ـ قطعە کردن ٢. قاچ کردن میوە (برای خوردن یا خُشک کردن)

**کوت لێدان:** ☜ **کوت پێوەدان**

**کوت**[2]: ئاوەڵناو. ١. لەت ‹کوتێ نان› ٢. کۆڵ؛ قامک پەڕیو (لە دەست یان پا) ﷼ ١. پارە ٢. انگشت قطع شدە

**ـ کوت**[3]: پاشەوشە. ١. کوتان ‹سەرکوت› ٢. ـ ڕێژ ‹بزمارکوت› ٣. ساز ‹دەسکوت› ٤. *[مەجاز]* لێدەر ‹لاکوت› ٥. گەڕ ‹کوڵانکوت› ٦. لەتکە؛ گەلاـگەلا وشکەوە کراو ‹شلانەکوت› ﷼ ١و٢. ـکوب ٣. ـ ساز ٤. ـ زن ۵. ـگرد ۶. برگە

**کوت**[4]: پێرۆ. ← **شێروکوت/ شلوکوت/ شەلوکوت**

**کوتا**[1] **/ kuta/:** ناو. دومـاهی؛ دوایی؛ کۆتایی ﷼ پایان

**کوتا**[2]: ئاوەڵناو. کنک؛ کوڵ؛ کن؛ قوڵ ﷼ کوتاه

**کوتار / kutar/:** ناو. کۆتەرە؛ بارستایی بەژنی دار ﷼ تنەی درخت

**کوتان**[1] **/ kutan/:** چاوگ. تێپەڕ. //کوتات؛ دەکوتی؛ بکوتە// کتان: ١. لێ دان ‹زەمانە وای کوتاوم، خۆم ناگرم لە سەر قوون! «مەلا غەفوور»› ٢. ورد کردن بە نهێم ‹باش بیکوتە ددان نەگرێ› ٣. *[شوورەیی]* سەرجێیی؛ پەڕینی نێر لە مێوینە ٤. پەترمە؛ واکسیناسیۆن؛ تێرۆ کردنی واکسین بۆ ناو لەش ‹منداڵەکانیان دژی ئاوڵە و دڕکە و مێکووتە کوتا› ٥. دەرزیئاژن کردن بۆ خاڵ لە سەر پێست ‹خاڵێکی لە سەر مەچەکی کوتاوە› ٦. بە تانک و تۆپ و چەکی دوورهاوێژ لێ دان ‹دژمن شار و دێی کوتا، هەموو خەڵک ئاوارە بوون› ﷼ ١. کُتک زدن ٢. کوبیدن در هاون ٣. جماع کردن ۴. واکسینە کردن ۵. خالکوبی کردن ۶. کوبیدن با اسلحەی سنگین

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: کوتاو/ چاوگی نەرێنی: نەکوتان

⊡ **کوتان پێ کردن:** بە هەوەس لێ دان؛ تێرـ تێر لێ دان ‹کوتانێ باشیان پێ کردا!› ﷼ حسابی کتک زدن

**کوتان گرتن/ گردن:** سوور بوون؛ پێ داگرتن ‹کوتانی گرتووە ئێژێ منیش تێم!› ﷼ دو پا را در یک کفش کردن

**کوتان**[2]: ناو. ١. جۆرێ گاسنی دەمپان ٢. پەترمە؛ واکسیناسیۆن؛ کار و ڕەوتی تێرۆ کردنی واکسین بۆ ناو لەش ﷼ ١. نوعی گاوآهن ٢. واکسیناسیون

**کوتاندن / kutandin/:** چاوگ. تێپەڕ. //کوتاندت؛ دەکوتێنی؛ بکوتێنە// کوتانن: ١. بە دار کوتان ٢. واکسین وەشاندن ٣. کوتانی خاڵ ﷼ ١. کوبیدن ٢. مایەکوبی کردن ٣. خالکوبی کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەکوتاندن

**کوتاندنەوە / kutand(i)newe/:** چاوگ. کوتاننەوە؛ کوتانەوە: ١. توند داکوتانی شتێ وەک پۆی کر ٢. سفت کردنەوە (سەربان و...) ﷼ ١. کوبیدن پود

قالی با شانه ٢. کوبیدن

**کوتانن** / kutanin/: ☜ **کوتاندن**

**کوتاننەوە** / kutannewe/: ☜ **کوتاندنەوە**

**کوتانـــــەوە** / kutanewe/: چـــــاوگ. ١. ☜ **کوتاندنەوە** ٢. دووبارە کوتان ☰ ١. ☜ **کوتاندنەوە** ٢. دوباره کوبیدن

**کوتاین** / kutayn/: چاوگ. ساتن؛ کوتان؛ قوتان ☰ کوبیدن

**کوتتلک** / kuttilk/: ناو. ١. کوتیلک؛ کفتەی ساوار و قیمە ٢. گجووک؛ تووتکە سەگ ☰ ١. کُتلت ٢. تولەسگ

**کوتتە**[١] / kutte/: ناو. کفتە؛ کوفتە ☰ کوفتە

**کوتتە**[٢]: دەنگ. زەهرەمار؛ ژەقنەمووت؛ وشـەیەکە بۆ دەربـڕینی بێـزاری دەگـوترێ ‹ــچـە؟ ـ چـە کوتتە!› ☰ کوفت

**کوتتین** / kuttîn/: چاوگ. خاڵ لە لەش کوتـان ☰ خالکوبی کردن

**کوتر**[١] / kut(i)r/: ناو. کۆت؛ کوت؛ سترە ☰ کُت

**کوتر**[٢]: ئاوەڵناو. ١. چاوکز؛ چـاو کـەمسـۆ ‹شـەوان چاوم کوترە› ٢. کوڵ؛ کنک؛ قوڵە؛ کۆتا ‹ئەم پەردە کوترە› ٣. نزم؛ بێ دەسەڵات ‹لەم کارەدا کـوترم!› ☰ ١. کمسو ٢. کوتاه ٣. ضعیف

**کوتران** / kutran/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //کـوترای؛ دەکوترێی؛ بکـوترێ// کوتریـان: ١. کفـت بـوونی ئەندام ٢. لـێدران بـە دار و... ٣. ورد کـران بـە شتی قورس ☰ ١. کوفته شدن اعضاء ٢. چوبکـاری شدن ٣. کوبیده شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: کوتراو/ چاوگی نەرێنی: نەکوتران

**کـوتراو** / kutraw/: ئاوەڵـناو. کتـاو؛ کوتیـاگ ☰ کوبیده

**کوترمە** / kutirme/: نـاو. چـاوەڕوانی؛ چاڤـنێری؛ چاوەنواری ☰ انتظار

**کوتریان** / kutiryan/: ☜ **کوتران**

**کـوتش** / kutiş/: چـاوگ. قوتـان؛ کوتـان بـە دار؛ دارکاری کردن ☰ چوبکاری کردن

**کوتـک** / kutik/: نـاو. ١. پتـک؛ پتیـک؛ پیـک ٢. کوتەک؛ کۆپار ٣. گجووک؛ تووتکـە سـەگ ☰ ١. پُتک ٢. چُماق ٣. تولەسگ

▣ **کوتک زای**: تووتکە سەگ (جنێوێکە) ☰ تولەسگ

**کوت . کوت**[١] / kut kut/: ئاوەڵـناو. لـەت ـ لـەت ☰ تکه ـ تکه

**کوت . کوت**[٢]: ئاوەڵکار. کوتە ـــ کوتـە؛ کـوتکوتـە؛ پارچە ـ پارچە ‹کوت ـ کوت و تیکە بە تیکەم بکەن و بمدەنە سەگ/ جێگەمە لەم دەرە نارۆم بـە جنێـو و بە کوتەک! «حاجی قادر»› ☰ قطعه ـ قطعه

**کوتکوتۆک** / kutkutok/: نـاو. دارکوتکە؛ دارتەقنـە؛ دارتەقێنە؛ دارەسمە ☰ دارکوب

▣ **کوتکوتۆکی چینک**: جـۆرێ دارسمەیـە ☰ نـوعی دارکوب

**کوتکوتۆکی کەسک**: جۆرێک دارەسمەیـە، پشـتی سەوز و بەرزگی سپی ئاماڵ سەوزە، لـە کـونی داردا هێلانە دەکا ☰ دارکوب سبز

**کوتکوتە** / kutkute/: ☜ **کوت ـ کوت**[٢]

**کوتکە** / kutke/: ناو. تووتکەسەگ ☰ تولەسگ

**کوتکەخەو** / kutkexew/: نـاو. وەنەوز؛ پینـەکی ☰ چُرت

**کوتل** / kut(i)l/: نـاو. کوتلـک؛ کوتیلـک؛ کـودک؛ کفتەی ساوار ☰ کوفتەی بلغور

**کوتلک** / kutlik/: ☜ **کوتل**

**کوتلوک** / kutluk/: ناو. ١. چڵووک؛ ترۆپکی دار ٢. بەچکەی لاور؛ بێچووی جانـەوەری دڕنـدە ☰ ١. بالاترین نقطەی درخت ٢. تولەی جانور درنده

**کوتلێت** / kutlêt/: ناو. کوتیلک؛ کوتل؛ خۆراکێ لـە تێکەڵی گۆشتی چەرخکراو، سێفەزەمینی کوتراو و تـۆزێ ئـارد، کـە وەک هـەویرێکی لـێ دێ و پارچە- پارچە لە ڕۆندا سووری دەکەنەوە ☰ کُتلت

**کوتن** / kutin/: چاوگ. گوتن؛ وتن ﷼ گُفتن

**کوتوپڕ** / kut û piř/: ☜ کتوپڕ

**کوتوپڕی** / kut û p(i)řî/: ☜ کتوپڕی

**کوتوکەش** / kut û keş/: ناو. زلە؛ هەراوهوریا؛ هەرا و زەنای کۆمەڵ ﷼ ولوله

**کوتولەت** / kut û let/: ناوەڵناو. شولگسە؛ کەلەپاچە؛ پس ـ پس؛ لەت ـ لەت ﷼ پاره ـ پوره

**کوتومت** / kut û mit/: ☜ کتومت

**کوتومزرەقی** / kut û mizreqî/: ناوەڵکار. کوتوپڕ؛ لەپڕ ﷼ ناگهان

**کوتە**[1] / kute/: ناو. ١. کون؛ کونا؛ کنا ٢. قونچکی میوە ٣. پت؛ ڕەوتی لێدانی ڕەگ ٤. بەفری پەستواو ٥. شوێنی شوێنەونکەی کەروێشک ٦. نۆین؛ گۆنجەی ئاو ٧. ☜ **گوتە ـ١** ﷼ ١. سوراخ ٢. دُمچەی میوه ٣. نبض ۴. برف انباشته ۵. محل رد گم کردن خرگوش ۶ آبراهه ٧. ☜ **گوته ـ١**

**کوتە**[2]: دەنگەناو. دەنگی کوتان ‹ئەوە کوتەی چییە؟› ﷼ صدای کوبیدن

**کوتە ـ**[3]: پێشوشە. کوت ـ ‹کوتەپەڕۆ؛ کوتەئاجۆر› ﷼ پاره ـ

**ـ کوتە**[4]: پاشەوشە. کوتان ‹دڵەکوتە؛ پێکوتە› ﷼ ـکوبی

**کوتەپەڕۆ** / kutepeřo/: ناو. تیتاڵ؛ شیتاڵ ﷼ تکه پارچه

**کوتەر**[1] / kuter/: ناو. بزگوڕ؛ شڕ؛ دڕاو ﷼ کُهنەپاره

**کوتەر**[2]: ناوەڵناو. ١. بەقەوەت؛ بەهێز ٢. کن؛ کنک؛ کۆتا ﷼ ١. کوبنده ٢. کوتاه

**کوتەزەل** / kutezel/: ناو. نیچک؛ پارچەیەکی کورت لە قامیش ﷼ قطعەی کوچک نی

**کوتەسیزە** / kutesîze/: ناو. قولی دەرزی؛ کونی دەرزی ﷼ سوراخ سوزن

**کوتەفڕ** / kutefiř/: ناو. هەنگوین ﷼ عسل

**کوتەک** / kutek/: ناو. تێلا؛ کۆپار. هەروەها: **کوتەک لێ دان؛ کوتەک خواردن** ﷼ چُماق؛ کدینه

**کوتەککاری** / kutekkarî/: ناو. کارەڕەهاتی کوتەک لێ دان. هەروەها: **کوتەککاری کردن** ﷼ کُتک‌کاری

**کوتەکوت**[1] / kutekut/: ناو. ١. *[شوورەیی]* کاری کوت پێوە دان ٢. پارچە ـ پارچەی قوماش ﷼ ١. کله در جماع ٢. پاره ـ پارەی پارچه

**کوتەکوت**[2]: ناوەڵکار. زرمەزرم؛ تەپەتە؛ بە زرمەوە ‹کوتەکوت خەریکی چیت؟› ﷼ تَق‌وتوق

**کوتەکوت**[3]: دەنگەناو. ١. دەنگی کوتان لە سەر یەک ٢. دەنگی پت دانی ٣. کووت کووت؛ وشەی بانگ کردنی سەگ ﷼ ١. صدای کوبیدن پیاپی ٢. صدای نبض ٣. کلمەی صدا کردن سگ

**کوتەکەڵ** / kutekeł/: ناو. سواڵەتە لەتە ﷼ تکه سُفال

**کوتەکی** / kutekî/: ناوەڵناو. ١. پڕاوپڕ؛ دەرگاخن؛ پڕی وا کە هیچی تر نەگرێ ‹دوو باری کوتەکی بار کرد› ٢. ناتەواو؛ نیمەچڵ؛ کەم‌وکورت ‹کارەکانی کوتەکین، نابنە کار!› ﷼ ١. پُر و آکنده ٢. نصفەنیمه

**کوتەڵ** / kuteł/: ☜ سەرکۆزەر

**کوتەڵە** / kuteļe/: ناو. تووتەڵە سەگ ﷼ تولەسگ

**کوتەن** / kuten/: ناو. دارکاری؛ کاری لێدان بە دار ﷼ چوبکاری

**کوتەنی**[1] / kutenî/: ناوەڵناو. شیاوی کوتن ﷼ گفتنی

**کوتەنی**[2]: ئامراز. وەک کوتوویە ‹کورد کوتەنی: کەس بە خەیاڵ نەبووە بە ماڵ› ﷼ گفتنی؛ به قولِ

**کوتیاگ** / kutyag/: ناوەڵناو. ١. بە کوتک کوتراو ٢. وردکراو ﷼ ١. کوبیده شده با پُتک ٢. خُرد شده

**کوتیان** / kutyan/: چاوگ. کوتران: ١. کوتان؛ کتان؛ کوتریان ٢. وتیان؛ گوتران ﷼ ١. کوبیدن ٢. گفته شدن

**کوتیل** / kutîl/: ☜ کەشکەزرانی

**کوتیلك** / kutîlik/: ☜ **کوتل**

**کوتیلە** / kutîle/: ناو. نازناوی زارۆی خۆشەویست ◘ واژەی نوازش کودک

**کوجك** / kucik/: ناو. گۆشە؛ سووچ ◘ کُنج؛ زاویە

**کوجیلە** / kucîle/: ناو. ١. دەرمانێکە جانەوەری پێ دەرمان‌داو دەکرێ ٢. گیای باقەبێن ◘ ١. دارویی سمی برای کشتن جانوران ٢. گیاه مخصوص بستن بافه

**کوچ**[١] / kuç/: ناو. خڕەبەرد؛ خڕکەبەرد؛ وردەکوچک ◘ قلوەسنگ

**کوچ**[٢]: ئاوەڵناو. گۆج؛ شەخت؛ شەهت؛ لەپۆل؛ گەپۆل؛ داملە؛ ئیفلیج؛ شەپلەلێ‌داو ◘ فلج

**کوچاك** / kuçak/: ناو. ئالاش؛ هەلاش؛ کەواشە؛ گەلا و چڵووی سەر دارەڕا ◘ انبیرە

**کوچقولێپ** / kuçqulêp/: ئاوەڵناو. لێقەوماو؛ چارەڕەش؛ ماڵوێران ◘ خانەخراب

**کوچك**[١] / kuç(i)k/: ناو. کوچگ: ١. بەرد؛ بەر؛ کەڤر ٢. تفک؛ کوانوو؛ کوانگ ◘ ١. سنگ ٢. اُجاق

▣ **کوچك کولاندن**: *[کینایە]* کاری بێ بایەخ کردن (لە داخان دەگوترێ) ‹ئاخر کوچک بکولێنی ئەمە کار بوو تۆ کردت؟!› ◘ کار بی ثمر کردن

**کوچك کێشان**: *[کینایە]* کاری زۆر دژوار کردن ◘ کار سخت کردن

**کوچك**[٢]: ئاوەڵناو. چکۆڵە؛ کوچگ؛ بچووک ◘ کوچک

**کوچکئاگر** / kuçik'agir/: ☜ **کوچکاور**

**کوچکانی** / kuçkanî/: ناو. کۆچک؛ کەفچی؛ قەڵماسک ◘ فلاخن

**کوچکاور** / kuçkawir/: ناو. کوچکئاگر؛ سێ‌بەردەی ئاگردان ‹ژنەکەی کەتری دامێ و لە سەر کوچکاورم دانابوو بکولێ، مێردەکەی هاتەوە، شەقێکی لە کەتری هەڵدا و بە پالەپەستۆ دەری کردم! «هەژار، چێشتی مجێور»› ◘ سنگ اُجاقدان

**کوچکبڕ** / kuçikbiř/: ناو. بەردبڕ؛ بەربڕ ◘ سنگ‌بُر

**کوچکتاش** / kuçiktaş/: ☜ **کەڤرتاش**

**کوچکتراش** / kuçikt(i)raş/: ناو. بەردتاش ◘ سنگ‌تراش

**کوچکچن** / kuçikçin/: ناو. ١. دیواری بە ئیشکەبەرد ٢. وەستای دانان و چنینی ئیشکەبەرد ◘ ١. استادکار سنگچینی ٢. دیوار سنگچین

**کوچکڕەش** / kuçikřeş/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* بەدفەڕ؛ بەدودم؛ شووم ◘ شوُم

**کوچککێش** / kuçikkêş/: ناو. بەردکێش؛ ئەوی کاری گواستنەوەی پارچەبەردە ◘ سنگ‌کش

**کوچکنوێژ** / kuçikn(i)wêj/: ناو. بەردەتات؛ بەردەنوێژ ◘ سنگ تخت ویژەی نماز خواندن

**کوچکواران** / kuçikwaran/: ناو. بەردەباران ◘ سنگ‌باران

**کوچکوکوانگ** / kuçik û k(i)wanig/: ☜ **کوانو**

**کوچکوکەڵەک** / kuçik û kełek/: ناو. قەلاقووچکە بوونی بەرد لە سەر یەک ◘ سنگ‌های برهم انباشته

**کوچکۆک** / kuçkok/: ئاوەڵناو. بیچکەڵە؛ بووچک؛ پچووک ◘ کوچولو

**کوچکە** / kuçke/: ناو. ١. بەردی کوانوو ٢. ڕێ‌کورک؛ بن‌بەست؛ ڕێگایەک (بەتایبەت کۆلان) کە سەرێکی دەرناچێ ٣. نیشانی ئەفسەری کەم‌پایە ◘ ١. سنگ اُجاق ٢. کوچەی بن‌بست ٣. نشان افسر دون‌پایە

**کوچکەبەرد** / kuçkeberd/: ناو. کەمەر؛ خڕکەبەرد ◘ قلوەسنگ

**کوچکەسان** / kuçkesan/: ☜ **کوچکەهەسان**

**کوچکەقوڵە** / kuçkequłe/: ناو. چمچەکۆڵە؛ کلکەتەشی؛ بەچکە بۆقی لاق دەرنەهاتوو ◘ قورباغەی نابالغ

**کوچکەهەسان / kuçkehesan/**: ناو. کوچکەسان؛ بەردەسان؛ بەردی تیخ تیژ کردن 🇮🇷 سوهان

**کوچکی / kuç(i)kî/**: ئاوەڵناو. سەنگی؛ بەردین؛ لە بەرد چێکری 🇮🇷 سنگی

**کوچگ / kuçig/**: ☜ کوچك

**کوچوله / kuçule/**: ☜ کوچوڵه

**کوچوڵه / kuçułe/**: ناو. کوچوله: ١. ژاره ماسی ٢. گیای باقەبێن 🇮🇷 ١. گیاه زهرماهی ٢. گیاه بستەبندی

**کوچەر / kuçer/**: ئاوەڵناو. کوتەر؛ کەل و کوتەر؛ دەست یان پا سەقەت 🇮🇷 از دست یا پا معلول

**کوچەلان / kuçelan/**: ناو. ئاگرخۆشکەری ناو گۆرک 🇮🇷 آتشبان

**کوچەڵه / kuçełe/**: ناو. کۆجەڵه؛ کاسەیێ کە بە قوڕ لە قەدی کۆتەی دارەوەنەوە دروستی دەکەن تا جاچکەی لێ کۆوە بێ 🇮🇷 نیمکاسەای از گل برای گرفتن سقز خام از درخت بنه

**کوچی / kuçî/**: ناو. ١. ئەستووراییی لە زەبر ٢. گۆچی؛ شەختی؛ ئیفلیجی؛ شەپلەلێدراوی 🇮🇷 ١. آماس از ضربت ٢. فَلَجی

**کوچیله / kuçîle/**: ناو. گیایەکە بنەکەی دەکەنە دەرمان ڕێوی 🇮🇷 گیاهی است

**کوخ / kux/**: ☜ کۆخە_١

**کوخار / kuxar/**: ناو. ١. سووچ؛ قوژبن ٢. ئامرازی شەق و شڕ 🇮🇷 ١. کُنج؛ زاویه ٢. قُراضه

**کوخاین / kuxayn/**: ☜ کۆکین

**کوخک / kuxik/**: ☜ کۆخە_١

**کوخکاڕەش / kuxkařeş/**: ناو. سیقوتە؛ قۆتک؛ قۆخەڕەشە 🇮🇷 سیاهسُرفه

**کوخین / kuxîn/**: ☜ کۆکین

**کود / kud/**: ناو. ١. شەپڵە؛ نەخۆشی ئیفلیجی ٢. چۆنیەتی کوژرانی بە خۆڕایی و بێ خوێنبایی ٣. ژمارەی تایبەت 🇮🇷 ١. بیماری فلج ٢. چگونگی بە قتل رسیدن و قصاص نشدن ٣. کُد

**کودان / kudan/**: چاوگ. ١. پێکهاتن؛ جێبەجێ بوون ٢. خایاندن؛ وەخت بردن 🇮🇷 ١. انجام گرفتن ٢. وقت بردن

**کوداندن / kudandin/**: چاوگ. ١. پێکهێنان؛ جێبەجێ کردن ٢. دنە/ هان دان ٣. لەسەرخۆ بوون ٤. خایاندن؛ وەخت بردن 🇮🇷 ١. انجام دادن ٢. تشجیع کردن ٣. متانت داشتن ۴. وقت بردن

**کودک / kudik/**: ناو. ١. ئەژنۆ؛ زرانی؛ وژنگ ٢. بێچووی لاور ٣. کوتک؛ پیک؛ پیتک ٤. ☜ کوتل 🇮🇷 ١. زانو ٢. بچەی حیوان وحشی ٣. پُتک ۴. ☜ کوتل

**کودکودۆ / kudkudo/**: ئاوەڵناو. وڕاج؛ چەقەسرۆ؛ زۆربڵێ؛ فرەوێژ؛ چەنەباز 🇮🇷 وراج

**کودو / kudû/**: ☜ کەدو _١

**کودەڵه / kudełe/**: ناو. بەچکەوەراز 🇮🇷 بچەخوک

**کودی / kudî/**: ناو. ١. بەچکەی سەگ و بەراز ٢. ☜ کەدو _١ 🇮🇷 ١. بچەی سگ و خوک ٢. ☜ کەدو _١

**کودیله / kudîle/**: ناو. ١. ساوای سەگ و بەراز ٢. [مەجاز] زارۆی ساوای جوانکیله ٣. قووڵایی؛ ناخ ‹له کودیلەی دڵییەوە بەو کارە ڕازییە› 🇮🇷 ١. نوزاد سگ و خوک ٢. نوزاد زیبا و دوستداشتنی ٣. عُمق

**کور / kur/**: ناو. ١. سیرەت؛ چووک؛ ئەندامی زاوزێی نێرینە ٢. ☜ کڵاو _١ 🇮🇷 ١. آلت تناسلی نر ٢. ☜ کڵاو _١

**کوراتا / kurata/**: ناو. حەنەک؛ قسەی خۆش و پێکەنینی 🇮🇷 لطیفه؛ جُک

**کوراس / kuras/**: ☜ کراس_١

**کوراگ / kurag/**: ☜ کارگ_١

**کوربەشک / kurbeşik/**: ☜ کوڕەبەش

**کورپ / kurp/**: ناو. تڵتە و بەرماوی میوەی ڕزیو کە دەکرێتە کووتی زرعات 🇮🇷 میوەی مانده که کودش

کنند

**کورت**[1] / kurt/: ناو. هەڵۆ؛ ئەلوە ☰ عُقاب

**کورت**[2]: ئاوەڵناو. کن؛ کنک؛ کۆتا ☰ کوتاه

◘ **کورت بون/ بین:** کۆتا بوون ☰ کوتاه بودن

**کورت بونەوە:** لە درێژییەوە کۆتا بوون ☰ کوتاه شدن

**کورت کردنەوە:** کورتەوە کردن؛ کۆتا کردنەوە ☰ کوتاه کردن

**کورتەوە کردن:** ☜ **کورت کردنەوە**

**کورتان** / kurtan/: ناو. کۆپان؛ کۆپەلان؛ کۆپەڵێن؛ پالان ☰ پالان

**کورتاندرو** / kurtand(i)rû/: ناو. کورتاندوور؛ کۆپاندوور؛ ئەو کەسەی کۆپان ئەدوورێ ☰ پالاندوز

**کورتاندور** / kurtandûr/: ☜ **کورتاندرو**

**کورتبری** / kurtb(i)řî/: ناو. کار و ڕەوتی کورت کردنەوەی قسە ☰ ایجاز؛ عمل کوتاه کردن سخن

**کورتبین** / kurtbîn/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* بیر نەکەرەوە و هەڵەڕۆ ☰ کوتەبین

**کورتپست** / kurtpist/: ناو. سرتە؛ چپە؛ پستەپست ☰ پچ - پچ

**کورتخەس** / kurtxes/: ناو. کار و ڕەوتی سەرچن کردنی تووتن ☰ عمل چیدن سر ساقەهای توتون

**کورتک** / kurtik/: ☜ **کورتە-١**

**کورتکورت** / kurt kurt/: دەنگەناو. دەنگی قیڕە و هەرا ☰ داد و قال

**کورتم** / kurtim/: ☜ **کورتمە**

**کورتمە** / kurtme/: ئاوەڵناو. کورتم؛ کورتی ئەستوور ☰ کوتاهِ کلفت

**کورتوپست** / kurt û pist/: ناو. پاشملە؛ پاشەملە؛ کاری لە پشتەسەر خراو گوتن ☰ عمل غیبت کردن

**کورتوکرمانجی** / kurt û kirmancî/: ئاوەڵکار. *[کینایە]* بێ‌ڕووبینی؛ ڕەپ و ڕاست ☰ رُک و صریح

**کورتوکوێر** / kurt û k(i)wêr/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* کورت و تەسک ☰ کوتاه و کم‌عرض

**کورتوموختەسەر** / kurt û muxteser/: ئاوەڵکار. بە کورتی و پوختی ☰ مُختصر و مُفید

**کورتون** / kurtun/: ناو. ماکێ کە لە کورتیزۆنەوە بەرهەم دێ ☰ کُرتُن

**کورتۆڵ** / kurtoł/: ناو. ورکە نان و بەرماوی سەر سفرە ☰ پس‌ماندەی سُفرە

**کورتە** / kurte/: ناو. ١. کورتک؛ کورتەک؛ کەوای پیاوانەی تا نزیک ئەژنۆ ٢. بارگیر؛ بارگین؛ قولە؛ ئەسپی نانەجیبی بارکێشان ٣. هەڵبژاردە؛ پوختە ‹کورتەی هەواڵەکان› ☰ ١. نیم‌تنەی مردانە ٢. یابو ٣. خُلاصەی کلام

**کورتەباڵا** / kurtebała/: ئاوەڵناو. کورتەلە؛ بەژن‌کورت؛ کابهوور ☰ کوتاەقد

**کورتەبنە** / kurteb(i)ne/: ئاوەڵناو. کورتەباڵای قەڵەو ☰ کوتاەقد چاق

**کورتە پانک** / kurtepanik/: ناو. جۆرێ ماسی ☰ نوعی ماهی

**کورتەچیرۆک** / kurteçîrok/: ناو. تمتیل؛ خدۆک؛ نەزیلە؛ نەزیرە ☰ داستان کوتاه

**کورتەک** / kurtek/: ☜ **کورتە-١**

**کورتەکەلەکە** / kurtekeleke/: ☜ **کێلەکە**

**کورتەلە** / kurtełe/: ☜ **کورتەباڵا**

**کورتەنێزە** / Kurtenêze/: ناو. زەرگ؛ خشت؛ دلام؛ ڕمب ☰ زوبین

**کورتەوەکراو** / kurtewek(i)raw/: ☜ **کۆتەر**[2]

**کورتی**[1] / kurtî/: ناو. کۆتایی: ١. کنکی؛ کولی؛ دژی درێژی ٢. کەمتەرخەمی ‹کورتی لە لایەن منەوە بوو، ببوورن› ٣. موختەسەری؛ دۆخی پوختە بوون؛ کۆتا بوون ‹بە کوردی و بە کورتی› ☰ ١و٢. کوتاهی ٣. اختصار

**کورتی**[٢]: ئاوەڵکار. هیچ نەبێ؛ لانی کەم 🇮🇷 اقلاً

**کورتیزۆن / kurtîzon/**: ناو. ماکێ کە لە لووی سەر گورچیلەوە دەدەڵێ 🇮🇷 کرتیزون

**کورتیلە / kurtîle/**: ئاوەڵناو. باواقۆرەت؛ زۆر قەدکورت 🇮🇷 کوتوله

**کورتێکە / kurtêke/**: ناو. کەسێ کە نان دەکاتە ورتکە 🇮🇷 شخصی که نان را ریزه می‌کند

**کورتێکەڵ / kurtêkel/**: ناو. دالاشێکە لە هەڵۆ دەکا 🇮🇷 لاشخوری شبیه عقاب

**کورتێل / kurtêl/**: ناو. ورکە نان؛ وردە نان 🇮🇷 خُرده نان

**کورتێلۆ / kurtêlo/**: ناو. خزمەتکاری وردەپیا 🇮🇷 خدمتکار دون‌پایه

**کورچاتوڤیوم / kurçatuvyum/**: ناو. توخمی کیمیاوی ڕادیۆئەکتیڤ بە ژمارەی ئەتومی ١٠٤، کە لە دارشتەی ناوکی پروتاکتینیومی ٢٤٢ و نیئونی٢٢ بە دەست دێ و نیوەتەمەنێکی زۆر کورتی هەیە 🇮🇷 کورچاتوویُم

**کورچی / kurçî/**: ناو. نقورچک؛ قورچی 🇮🇷 نیشگون

**کورد / kurd/**: ناو. نەتەوەی سپی‌پێستی زاگەبەری نێوچۆمان و دەوروبەری 🇮🇷 کُرد

**کوردانە**[١] **/ kurdane/**: ئاوەڵناو. ١. کوردئاسا ٢. کوردی؛ پێوەندیدار یان سەر بە کورد ‹هەر کەس تیتۆڵە پشتێندێک، بزگوڕە مێزەرێک بە قەد و سەرییەوە با، یان پاتۆڵ و ڕانکی نێفەکشۆڕی کوردانەی بوایە، بە دار و قامچی بەر دەبوونە گیانی و... «هەژار، چێشتی مجێور»› 🇮🇷 ١و٢. کُردی

**کوردانە**[٢]: ئاوەڵکار. ١. *[مەجاز]* ئازایانە؛ دلێرانە؛ بوێرانە ٢. کوردئاسایی؛ وەکوو کوردان 🇮🇷 ١. شُجاعانه ٢. مانند کُردان

**کوردایەتی / kurdayetî/**: ناو. کوردیتی؛ کوردینی؛ کوردێتی: ١. هەر جۆرە هەست و هەوڵێ کە نیشانەی کورد بوون بێ ٢. بارودۆخی کورد بوون 🇮🇷 ١. ملیّت‌خواهی کُردی ٢. کُردی

**کوردپەروەر / kurdperwer/**: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی کەسێ کە بۆ کوردایەتی خەبات دەکا. هەروەها: **کوردپەروەری** 🇮🇷 ملیّت‌خواه کرد

**کوردحەز / kurdĥez/**: ئاوەڵناو. کوردخۆشەویست؛ تایبەتمەندی کەسێ کە حەز لە کوردایەتی دەکا 🇮🇷 کُرددوست

**کوردسان / kurd(i)san/**: ☜ **کوردستان**

**کوردسانی / kurd(i)sanî/**: ☜ **کوردستانی**

**کوردستان / kurdistan/**: ناو. کوردسان؛ بەشێ لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست کە کوردزمانانی تێدا دەژین 🇮🇷 کُردستان

**کوردستان‌پەرست / kurdistanperist/**: ئاوەڵناو. خزمەتکاری گەل و زێدی کورد 🇮🇷 دوستدار کُرد و کُردستان

**کوردستانی / kurdistanî/**: ئاوەڵناو. کوردسانی: ١. خەڵکی کوردستان ٢. پێوەندیدار بە کوردستانەوە ‹ناوچە کوردستانییەکان› 🇮🇷 ١و٢. کُردستانی

**کوردکانی / kurdkanî/**: ناو. وڵاتی کوردان؛ کوردەواری 🇮🇷 کُردستان

**کوردکوژ**[١] **/ kurdkuj/**: ناو. ئەوی کاری کوشتن و قڕ کردنی خەڵکی کوردە 🇮🇷 کُردکُش

**کوردکوژ**[٢]: ئاوەڵناو. خووگرتوو بە کورد کوشتن یا لایەنگر و هۆگری کورد کوشتن 🇮🇷 خواستار و دوستدار کشتن کُردها

**کوردکوژە / kurdkuje/**: ناو. *[مەجاز، پلار]* ١. قەسپ؛ جۆرێ خورمای خراپ ٢. جۆرێ ترێ تفت 🇮🇷 ١. نوعی خرمای نامرغوب ٢. نوعی انگور گس

**کوردمانج / kurdmanc/**: ☜ **کرمانج**

**کوردنۆ / kurdno/**: سارستە. کوردۆ؛ ئەی کوردینە؛ وشەی دواندنی کوردان 🇮🇷 ای کُرد زبانان

**کوردوندە / kurdunde/**: ئاوەڵناو. وەجاخ‌کوێر؛

بێ‌عەولاد ابتر؛ بی‌فرزند

**کوردۆ**[١] / kurdo/: ناو. قامێکە آهنگی است

**کوردۆ**[٢]: سارستە. کوردنۆ؛ وشەی دواندنی کوردێک ای انسانِ کُرد

**کوردە** / kurde/: ناو. *[کینایە]* شوان؛ شوانە؛ گەلەوان چوپان

**کوردەواری** / kurdewarî/: ناو. کوردستان؛ مەڵبەندی کوردان کُردستان

**کوردی**[١] / kurdî/: ناو. ١. دەستە زمانی نەتەوەی کورد، کە بە هۆی مێژووی ژیان و هۆکاری جۆگرافیاییەوە؛ چەند وەچەزمان (زار)ی جۆراوجۆری لێ دەبێتەوە و بریتین لە: *ئا)* کرمانجی باکوور، بە شێوەزارگەلی بادینی، بۆتانی، هەکاری، بایزیدی، شەمدینی، جزیری، قووچانی و... *ب)* کرمانجی ناوەندی کە سۆرانیشی پێ دەڵێن، بە شێوەزارگەلی سۆرانی، موکوریانی، ئەردەلانی، بابانی، جافی و... *پ)* کرمانجی باشوور بە شێوەزارگەلی کەلهوڕی، لەکی، فەیلی، بەختیاری و... *ت)* گۆرانی (هەورامی) ـ زازایی، ئەمیش بە چەند شێوەزار و زۆرێ بن‌زاراوەوە ٢. چێشتی هەرزنی وردکراو بە ڕۆنەوە ١. زبان کُردی ٢. غذایی است

**کوردی**[٢]: ئاوەڵناو. ١. چێکراوی کوردان ‹قالی کوردی› ٢. پێوەندیدار بە زمان، فەرهەنگ و داب و نەریتی کوردییەوە ١. ساخت کُردها ٢. کردی؛ منسوب به کُردها

**کوردیتی** / kurdîtî/: ☜ **کوردایەتی**

**کوردینی** / kurdînî/: ☜ **کوردایەتی**

**کوردێتی** / kurdêtî/: ☜ **کوردایەتی**

**کورژان** / kurjan/: چاوگ. کورژین: ١. چرچ بوون؛ قرمچین ٢. ژاکان؛ سیس بوون ١. چروک شدن ٢. پژمُردە شدن

**کورژاندن** / kurjandin/: چاوگ. ١. چرچ و لۆچ تێ خستن ٢. ژاکاندن؛ سیس کردن ١. چروک کردن ٢. پژمُردە کردن

**کورژین** / kurjîn/: ☜ **کورژان**

**کورس** / kurs/: ناو. ١. بنە دڕوو ٢. چەکەرەی تازە سەر دەرهێناو ١. بوتەی خار ٢. سبزەی تازە سر درآوردە

**کورسان**[١] / kursan/: چاوگ. هەڵقرچان؛ قرمچین چروک شدن

**کورسان**[٢]: ناو. *[سووکەڵە]* کوردستان کُردستان

**کورساندن** / kursandin/: چاوگ. ١. هەڵقرچاندن ٢. ژاکاندن ٣. کرۆستنەوە ١. چروک کردن ٢. پژمردە کردن ٣. کلوچیدن

**کورسانی** / kursanî/: ناو / ئاوەڵناو. سنەیی؛ خەڵک یان سەر بە شاری سنە سنندجی

**کورسک** / kursik/: ☜ **کرۆسك ـ١**

**کورسی** / kursî/: ناو. ١. سەندەڵی؛ ئەسکەمل ٢. قورسی؛ داری لێکدراو بۆ سەر تەنوور یان هەر شتێکی گەرمادەر ٣. خلێنە؛ ددانی پشت پشتەوە ١. صندلی ٢. کُرسی ٣. دندان عقل

▣ **کورسی قورعان**: دوو تەختەی تێک‌پەڕیوە قورعانی لە سەر دەکەنەوە بۆ خوێندنەوەی رحلەی قرآن

**کورسیت** / kursît/: ناو. ١. مەمک‌بەند؛ سینەبەن ٢. پۆشەنی تەنگ بۆ بەرگری لە داهێزانی ماسوولکە و ئەندامانی لەش ١و٢. کُرسِت

**کورسیلە** / kursîle/: ناو. چوارپایەی چکۆلە چهارپایەی کوچک

**کورسین** / kursîn/: چاوگ. ١. ڕەگ داکوتان و قایم بوونی چناو ٢. کورۆژیان؛ کرۆژان؛ هاڕدران (بە ددان یا شتی وا) ١. ریشە دواندن ٢. کلوچیدن

**کورش** / kurş/: ئاوەڵناو. کز؛ مات افسُردە

▣ **کورش هەڵاتن**: کز کردن؛ کروشمە کردن کز کردن

دووپشک ≡ عقرب

**کوڵەوار** / kułewar/: ناو. دڕکەژاڵ؛ حوشترالۆک؛ وشترخۆره ≡ خارشتر

**کوڵەوەی باب** / kułewey bab/: ☜ **کوڵەمار**

**کوڵەوەی وا** / kułewey wa/: ☜ **کوڵەمار**

**کوڵەوەی واو** / kułewey waw/: ☜ **کوڵەمار**

**کوڵەهەیبە** / kułeheybe/: ناو. کوڵەوەیباب؛ مارێکی ژەهراوییە ≡ نوعی مار سمی

**کوڵهاتو** / kułhatû/: ئاوەڵناو. کولاتگ؛ جۆشیاو؛ کولاتوو ≡ جوشیده

**کوڵی** / kułî/: ناو. کورتی؛ کۆتایی ≡ کوتاهی

**کوڵیاگ** / kułyag/: ☜ **کوڵاو-١و٢**

**کوڵیان** / kułyan/: ☜ **کوڵان**

**کوڵیایی** / kułyayî/: ناو. کولیایی: ١. لە تیرەکانی کورد ٢. هەر یەکە لە کەسانی ئەو هۆزە ≡ ١و٢. کُلیایی

**کوڵیت** / kułît/: ناو. ماڵک؛ کۆخ؛ کۆختە ≡ کوخ؛ کُلبه

**کوڵیتە** / kułîte/: ☜ **کۆڵیت**

**کوڵین** / kułîn/: ☜ **کوڵان**

**کوڵینگ** / kułîng/: ☜ **کوڵنگ**

**کوڵیو** / kułîw/: ئاوەڵناو. جۆشیو؛ گریا؛ کوڵاو؛ کەلاتی؛ کەلی ≡ جوشیده

**کوڵێجە** / kułêce/: ☜ **کوڵەنجە**

**کوڵێن**[1] / kułên/: ناو. دەفری سواڵەت تایبەتی شیر ≡ ظرف سُفالین ویژەی شیر

• **کوڵێن**[2]: پاشەوشە. بکوڵێن ‹شیرکولێن› ≡ ـ پز

**کوم** / kum/: ناو. ١. کون؛ کونا ٢. کلاو؛ کولاف ٣. سەر؛ کلاوە ≡ ١. سوراخ ٢. کُلاه ٣. کُلاهک

**کوماتەک** / kumatek/: ناو. ١. بابۆڵەی ساوا تێپێچان ٢. دەسرازەی لانک ≡ ١. قُنداق بچه ٢. دستپیچ قُنداق

**کوماچە** / kumaçe/: ناو. شمش؛ کەستەک؛ شیش ≡ شمش

**کوماخ** / kumax/: ناو. سمت؛ لاقوون؛ ئەستوورایی بەر کەمەر ≡ باسن

**کومانج** / kumanc/: ناو. بانجێلە؛ بانجیلە؛ بانیجە ≡ خربشته

**کومبار** / kumbar/: ناو. ڕایەخ؛ فەرش ≡ فرش

**کومبر** / kumbir/: ناو. شوێنەواری تاشراو لە شاخ و ماهدا ≡ صخرەی تراشیده

**کومبرەک** / kumb(i)rek/: ناو. ١. دوندی کێو؛ ترۆپکی چیا ٢. سەرلق؛ چلەپۆپە ≡ ١. قُلەی کوه ٢. شاخەی انتهایی

**کومبە** / kumbe/: ناو. هەڵوایەکە لە ئارد و دمس و کونجی دەکرێ ≡ نوعی حلوا

**کومبەت**[1] / kumbet/: ناو. گومەز؛ گومبەز ≡ گُنبد

**کومبەت**[2]: ئاوەڵناو. هەرەبەرز ≡ بسیار مُرتفع

**کومبەتاڵ** / kumbetał/: ☜ **کونبەتاڵ**

**کومبەلۆک** / kumbelok/: ☜ **کارگ-١**

**کومتل** / kumtil/: ناو. کلۆی چکۆلە ≡ کلوخک

**کومتیژ** / kumtîj/: ناو. تانج؛ تاج؛ کلاوی قووچ ≡ تاج

**کومچا** / kumça/: ناو. دوگمە؛ قوپچە؛ پشکوژ ≡ دُکمه

**کومسا** / kumsa/: ناو. ڕەوتی برینگاندنی باران؛ خۆش کردنەوەی باران ≡ فرایند بند آمدن باران

**کومسۆر** / kumsor/: ناو. [کینایە] ١. کلاوسوور؛ تورکی عوسمانی ٢. قزلباشی ئێران ٣. عێلی بارزان ≡ ١. تُرک عثمانی ٢. قزلباش ایرانی ٣. ایل کُرد بارزانی

**کومسە** / kumse/: ناو. تاقەت؛ توان؛ تابشت ≡ یارا؛ توان

**کومشین** / kumşîn/: چاوگ. هەڵقرچان؛ قرمچین ≡ چروک شدن

**کومک** / kumik/: ناو. کلاوقووچ؛ قینا؛ شەوکلاو ≡

کُلاه شب

**کومکانێ** / kumkanê/: ناو. پاسووران؛ وەرەق‌بازی؛ گەنجەفە ☰ ورق بازی

**کومکومۆک** / kumkumok/: ناو. خەمەگروو؛ خمخمۆکە؛ قومقومۆک ☰ بُزمجه

**کومکومین** / kumkumîn/: چاوگ. چەمۆڵە دادان (سەگ و شێر و درندەی تر) ☰ چنگال انداختن (حیوان درنده)

**کومکیشڤان** / kumkîş(i)van/: ناو. گیایەکی دەشتییە ☰ گیاهی است

**کومۆنیست** / kumonîst/: ئاوەڵناو. سوور؛ شیوعی ☰ کمونیست

**کومین** / kumîn/: ناو. ژیرە، زیرە؛ زیرن ☰ زیره

**کومێتللی** / kumêtillî/: ناو. گوفک؛ سەری قامک ☰ سرانگشت

**کون**[1] / kun/: ناو. کونا: ١. کوم؛ خووز؛ هلۆلی؛ شەبەق؛ بۆشاییەکی خڕ و کەم تا زۆر قووڵ لە ڕووبەری شتێکدا ٢. کەلما؛ هێلانەیێ کە گیانەوەران بە هەڵکۆلینی شوێنێ بەدی دێنن یان لە دەرەتانێکی تەنگدا سازی دەکەن ‹کونی مار؛ کونی مشک› ٣. ڕۆچنە؛ ڕۆچن ☰ ١. سوراخ ٢. سوراخ حشرات و جانوران وحشی ٣. روزنه

⊡ **کون کردن**: کونا کردن: ١. قول کردن؛ کون تێ کردن ٢. *[کینایە، ناشیرین]* کچ کردنە ژن ☰ ١. سوراخ کردن ٢. برداشتن بکارت

**کون**[2]: ئاوەڵناو. ١. کول؛ نەبڕ ٢. کونا؛ کون‌تێ‌بوو ☰ ١. کُند ٢. سوراخ

⊡ **کون بوون**: ١. قول بوون ٢. کونا تێ بوون ٣. سووتان لە هەندێ کایەدا. هەروەها: **کون کردن** ☰ ١. سوراخ بودن ٢. سوراخ شدن ٣. سوختن در بازی

**کونا**[1] / kuna/: ☜ **کون**[1]

**کونا**[2]: ☜ **کون**[2] ـ٢

**کونار** / kunar/: ناو. کەنار؛ کینار؛ تەبگ؛ تەعەو؛ سیتر؛ سیدرە؛ دارێکی گەرمیانی بە لقی ڕووت، گەڵای چکۆلەی تیژ و ڕەنگی سەوزی تۆخەوە کە میوەیەکی نارنجی و خۆراکی هەیە ☰ کُنار

**کونارشک** / kunarişk/: ناو. ئەنیشک؛ ئانیشک؛ قولانیسک ☰ آرنج

**کوناکونا** / kuna kuna/: ئاوەڵناو. کەفەڵووک؛ کەفەڵۆک ☰ مُتخلخل

**کونامووری** / kunamûrî/: ناو. شارەمێروو ☰ لانەی مورچه

**کوناوجە** / kunawce/: ☜ **کوناوچە**

**کوناوچە** / kunawçe/: ناو. کوناوجە؛ ڕۆچن؛ ڕۆچنە ☰ روزن

**کوناودەر** / kunawder/: ئاوەڵناو. کوناودیو؛ کون لە هەر دوو دیو ☰ از دو طرف سوراخ شده

**کوناودیو** / kunawdîw/: ☜ **کوناودەر**

**کوناوەجگە** / kunawec(i)ge/: ☜ **کلاوڕۆچنە**

**کوناوەجە** / kunawece/: ☜ **کلاوڕۆچنە**

**کوناوی** / kunawî/: ئاوەڵناو. سماو؛ کونکراو ☰ سوراخ شده

**کونبڕ** / kunbiř/: ئاوەڵناو. هەموو کون و بابوێر دادراو (خانوو) ☰ منفذبسته

**کونبەتاڵ** / kunbetał/: ناو. *[کینایە، ناشیرین]* کومبەتاڵ؛ بێوەژن؛ ژنی بێ شوو ☰ بیوەزن

**کونتار** / kuntar/: ناو. بناری چیا؛ داوێنی کێو ☰ دامنەی کوه

**کونتەرات** / kunterat/: ☜ **قونتەرات**

**کونتەراتی** / kunteratî/: ئاوەڵناو. بڕە؛ لەقەبەڵ؛ مەختە ☰ کُنتراتی

**کونج**[1] / kunc/: ناو. ١. سووچ؛ قوژبن ‹ئاخرین ماڵی ژیانم کونجی بەندیخانەیە/ ئەم کەلەپچە مەرهەمی زامی دڵی دێوانەیە «قانع»› ٢. دەفری سواڵەت بۆ گیا تێدا چاندن ☰ ١. کُنج ٢. گُلدان سُفالین

**کونج**[2]: ناوەڵناو. ١. جنجیر؛ ڕەشباز ٢. ئاولاوی؛ هاولەڕوو؛ دم و چاو خرویلکاوی ☰ ١. خالدار سیاه و سفید ٢. آبلەرو

**کونجانـدن / kuncandin/**: چاوگ. کونجرین؛ داکرۆژتن؛ کونجراندن؛ هاڕین؛ ورد کردن (بە ددان و...) ☰ خاییدن

**کونجره / kunc(i)re/**: ناو. کونجری؛ پەنێرشک؛ نووسنەک ☰ گیاهی خاردار

**کونجری / kunc(i)rî/**: ☜ **کونجره**

**کونجرین / kunc(i)rîn/**: ☜ **کونجاندن**

**کونجڕ / kunciř/**: ناوەڵناو. ١. زبر؛ زرو ٢. جنجیر؛ ڕەشباز ☰ ١. زبر ٢. خالدار

**کونجڕاندن / kunc(i)řandin/**: ☜ **کونجاندن**

**کونجڕک / kunc(i)řik/**: ☜ **کونجڕکە**

**کونجڕکە / kunciřke/**: ناو. کونجڕک؛ قورنج؛ قورینج ☰ نیشگون

**کونجڕە / kunc(i)ře/**: ناو. پێکول؛ گیایەکی دڕکاوییە ☰ خار سەکوهە

**کونجک / kuncik/**: ناو. ١. بالاپۆشی دەرویشان ٢. کونی وردیلەی پێست ٣. کونج؛ کونچک؛ سووچ ☰ ١. خرقەی درویشان ٢. مسامات ٣. کُنج؛ گوشە

**کونجکاو / kunckaw/**: ناوەڵناو. تۆژەرەوە؛ کۆڵەرەوە. هەروەها: **کونجکاوی** ☰ کُنجکاو

**کونجکونجێن / kunckuncên/**: ناو. جۆرێ یاری ☰ نوعی بازی

**کونجگر / kuncgir/**: ناوەڵناو. کنارێن؛ لاتەریک؛ گۆشەگیر؛ دوورەپەرێز لە خەڵک ☰ مُنزوی

**کونجوڕ / kunciř/**: ناو. کونجوڵ؛ قوژبنی تەنگ ☰ گوشەی تنگ

**کونجوڵ / kuncuł/**: ☜ **کونجوڕ**

**کونجە / kunce/**: ☜ **کونجی**

**کونجەڵە / kuncełe/**: ناو. کاسەی دارین ☰ کاسەی چوبی

**کونجی / kuncî/**: ناو. کونجە؛ کونجیت؛ شەیدانک؛ کتاف: ١. گیای یەکساڵە بە دانی چکۆلەی ساف و هێلکەئاساوە ٢. تووی ڕۆنداری خۆراکی ئەو گیایە کە چەند جۆری سپی، ڕەشوسپی، خەنەیی و قاوەیی هەیە ☰ ١و٢. کُنجد

▣ **کونجی کەرک**: گوڵ بەهەنگ؛ کونجی خۆڕسک؛ کونجیە کێویلە ☰ کُنجد کوهی

**کونجیت / kuncît/**: ☜ **کونجی**

**کونجی ـ کونجی / kuncî kuncî/**: ناوەڵناو. خاڵ ـ خاڵ؛ پنۆک ـ پنۆک ☰ خالخالی

**کونجین / kuncîn/**: چاوگ. کونجاندن؛ داکرۆژین ☰ خاییدن

**کونچک / kunçik/**: ناو. ١. کونی وردیلەی پێست ٢. کونج؛ سووچ؛ قولینج ٣. کونی زۆر ورد ☰ ١. مسامات ٢. گوشە؛ زاویە ٣. سوراخ بسیار ریز

**کونچکۆڵی / kunç(i)kołî/**: ناو. کنە؛ کار و ڕەوتی گەڕان و توێژینەوە ☰ تحقیق؛ کُنجکاوی

**کوند**[1] **/ kund/**: ناو. بائەقوش؛ بادەقوش؛ باوەقوش؛ بایەقوش؛ کەپوو؛ بو؛ بوم؛ بوو؛ بووک؛ بووە؛ بووەتەقڵە؛ بووەکوێرە؛ بووکەرە؛ خالەکوکومە؛ فشفشە؛ کەڵکەڵەوانی؛ تۆرەمە باڵندەیەکن بە شەو ڕاو دەکەن، سەریان زل و دەموچاویان پان و زەقە، دندووکیان قەڵانگییە، پەنجە و جنجرووکی تیژ و بەهێزیان هەیە، لاقیان تووکنە، بێهەست دەفڕن، بە تەنیا دەژین، لە کونی کەلاوە یان لە سەر عەزر هێلانە دەکەن، مشک، بۆق، ماسی، مێش و... ڕاو دەکەن چەندین جۆریان هەیە کە بریتین لە: تاقتاق، کوندەپشیلە، کوندەڕۆماڵ، کوندەزێڕە، کوندەزێوە، کوندەسپی، کوندەشەخسە، کوندەگایە و... ☰ جُغد

▣ **کوندی بۆن**: جۆرێ کوندی زەلام ☰ نوعی جُغد درشت

**کوندیٚ شەڤی**: کوندێکی ڕەنگاوڕەنگە ◙ نوعی جُغد رنگارنگ

**کوندیٚ گۆڕا**: جۆرە کوندێکە لە زەلکاوان و گۆڕستان دەژی ◙ نوعی جُغد

**کوند**[٢]: ئاوەڵناو. کلک‌قولە؛ جووچکەکوڵ ◙ دُم‌کوتاه

**کوندر / kundir/**: ☜ **کەدوو ـ١**

◙ **کوندرێ‌میرانی**: کوولەکەسەراوی؛ شاقەپاغی؛ کدوو بارزانی ◙ کدوحلوایی

**کوندڕ / kundiř/**: ☜ **کەدوو ـ١**

**کوندک / kundik/**: ناو. ١. ☜ **کەدوو ـ١** ٢. ☜ **کوندە**

◙ **کوندکێ ئاڤی**: کوولەکە سەراوی ◙ کدوتنبل

**کوندکێ کۆسە**: کدووی دۆڵمە ◙ کدوی دُلمە

**کوندڵفس / kundiłfis/**: ئاوەڵناو. [پلار] باوەعەمرە؛ چلەنۆک ◙ کوتولە

**کوندوش / kunduş/**: ناو. کونۆش: ١. ماکێکە هێندێک لە جیاتی تووتن کێشان ئەیکەنە بێڤلیانەوە ٢. سووژن؛ گندۆش؛ گۆچەوەنی؛ دەرزی زەلامی کون‌گەورە بۆ دروان بە بەنی ئەستوور ◙ ١. نوعی انفیه ٢. جوالدوز

**کوندە / kunde/**: ناو. کوندک؛ کونگە؛ کونە؛ دەفری زەلام لە چەرم بۆ ئاو کێشان ‹کەر لە کوێ کەوتووە و کوندە لە کوێ دڕاوە! «مەسەل»› ◙ مشک آبکشی

**کوندەبوو / kundebû/**: ناو. کوندەبەبوو؛ کوندەبوومە؛ کوندەبەبی؛ کوننەبەبوو؛ بوومی زل؛ کوندی زل ◙ بوف؛ جُغد بزرگ

**کوندەبوومە / kundebûme/**: ☜ **کوندەبوو**

**کوندەبەبوو / kundebebû/**: ☜ **کوندەبوو**

**کوندەبەبی / kundebebî/**: ☜ **کوندەبوو**

**کوندەپشیلە / kundep(i)şîle/**: ناو. جۆرێک کوندە، برۆی سپییە، پەڕی گوێی درێژە و وەک شاخ لە سەری بەرز بۆتەوە ◙ جُغد گوش دراز

**کوندەڕۆماڵ / kundeřomał/**: ناو. ڕۆماڵ؛ جۆرێک کوندە، پێچەوانەی کوندەگا شاخی قیت نییە و شۆڕە، لاقی زەرد و ڕووتە، هەمیشە لە نزیک ئاو دەبینرێت ◙ جُغد ماهی‌خوار

**کوندەز / kundez/**: ☜ **کەوچێز**

**کوندەزێڕە / kundezêře/**: ناو. جۆرێک کوندە، پشتی قاوەیی ئاماڵ نارنجی، سەر و ملی زێڕی، بەرزکی سپییە و زەردایی‌شی هەیە، زۆر کەمن ◙ جُغد طلایی

**کوندەزێوە / kundezêwe/**: ناو. جۆرێک کوندە، سەری گەورە و خڕ، چاوی ڕەش و پەڕی گوێی نییە ◙ گونەای جغد

**کوندەسپی / kundes(i)pî/**: ناو. جۆرێک کوندە، دەم‌وچاو و بەرزگی تەواو سپییە، شاخی تووکی نییە، قیت هەڵدەنیشێ ◙ جغد سفید

**کوندەسەرپان / kundeserpan/**: ☜ **کوندەشەخسە**

**کوندەشەخسە / kundeşexse/**: ناو. کوندەسەرپان؛ جۆرێک کوندی بچووکە، لە سەر دار تێل و چەپەران قیت هەڵدەنیشێ ◙ نوعی جُغد کوچک

**کوندەفسک / kundefisk/**: ئاوەڵناو. [پلار] کوندڵفس؛ باوەعەمرە؛ باواقۆرەت؛ چلەنۆک ◙ کوتولە

**کوندەقوتە / kundequte/**: ناو. جۆرێک کوندی لای زۆنگ و زەلکاوانە ◙ جغد تالابی

**کوندەکی / kundekî/**: ناو. جنچکە؛ توولنج؛ تووتەک؛ قوونەلتس ◙ چُمباتمە

**کوندەگا / kundega/**: ناو. بم؛ شابوو ◙ شاەبوف

**کوندەگایە / kundegaye/**: ناو. بم؛ شابوو؛ شاپوو؛ گەورەترین کوندی تۆرەمەی کوندە، نزیک ٧٠ سانتی‌میتر دەبێ، دوو دەستە تووک وەک شاخ لە سەریدا ڕوواوە، دەتوانێ گیانەوەری گەورەی وەک کەروێشک ڕاو بکا ◙ شاەبوف

**کوندەڵان / kundełan/**: ناو. کوننەڵان؛ کونەڵان؛ جێگەی کوندەئاو لێ دانان ◙ جای مشک آب

**کوندەمێز** / kundemêz/: ئاوەڵناو. مێـزن؛ مێـزەکـ؛ خۆتەڕکەر ▤ شاشو

**کونزوان** / kunz(i)wan/: ئاوەڵـناو. تـور؛ لاڵـەپەتە؛ پاڵ؛ زمانگران ▤ الکن

**کـونزەیـن** / kunzeyn/: ئاوەڵـناو. زەیــن کــوێر ▤ کُندذهن

**کونک** / kun(i)k/: ناو. ناوەند؛ ناوەڕاست ▤ وسط

▣ **کونکا چاڤد** گلێنەی چاو ▤ مردُمک چشم

**کونکـون** / kun kun/: ئاوەڵـناو. دابێــژ ـ دابێــژ؛ شەبەق ـ شەبەق ▤ سوراخ ـ سوراخ

**کونکە** / kunke/: ناو. گۆزە؛ جەڕە ▤ کوزە

**کونکەرە** / kunkere/: ناو. شخاب؛ شخاڤ؛ مەتکـەو ▤ متّه

**کونگ**[1] / kung/: نـاو. ١. *[شـوورەیی]* قنـگ؛ قـوون؛ کونی پاشەوە ٢. گۆنگ؛ کاکڵی دارگـوێز کـە بـۆ ڕەنگ بە کار دێت ▤ ١. مقعد ٢. مغز درخت گردو

**کونگ**[2]: ئاوەڵناو. ١. بێهـۆش ٢. سـڕ و تـەزیو ▤ ١. بیهوش ٢. کرخت

**کـونگر** / kungir/: نـاو. ڕەخنــەگر؛ ڕەغنــەگر ▤ درزگیر

**کونگە** / kunge/: ☜ **کوندە**

**کونگی** / kungî/: ناو. چارداخ؛ دیوارۆکەی نەوی بۆ مالات تێ‌کردن ▤ حصار کوتاه گلی نگهداری دام

**کونگیرە** / kungîre/: ناو. کۆنگرە؛ قەڵبە؛ کۆنگـەرە؛ ددانەی سەر لێوەی دیـواری کۆشـک و قـەڵا ▤ کُنگره؛ دندانەی روی دیوار قصر و قلعه

**کـــونمیز** / kunmîz/: نـــاو. میزەچورتـــــێ؛ گمێزەچۆرتکێ؛ مێزەچورتکێ؛ دۆخی لە دەسـت دانی توانایی ڕاگرتنی میز ▤ چکمیزک

**کوننە** / kunne/: ناو. کونە؛ کوندەی ئـاو ▤ مشـک آبی

**کوننەبەبو** / kunnebebû/: ☜ **کوندەبو**

**کوننەزرانی** / kunnez(i)ranî/: ☜ **کەشکەزرانی**

**کوننەڵان** / kunnełan/: نـاو. ١. ☜ **کونـدەڵان** ٢. گرد؛ تەپۆلکە ▤ ١. ☜ **کوندەڵان** ٢. تپّه

**کونوڕ** / kunuř/: ناو. جەوی دار قەزوان ▤ کُندُر

**کونـۆ** / kuno/: نـاو. ١. سـووچ؛ قـوژبن ٢. *[کینایە]* ماڵی پچووکی تەنیایی ▤ ١. کـنج؛ زاویـە ٢. کُـنج عُزلت

**کونۆش**[1] / kunoş/: ☜ **کوندوش**

**کونـۆش**[2]: ئاوەڵـناو. ڕژد؛ ڕەزیـل؛ دەس‌قووچـاوو ▤ خسیس

**کونۆشە** / kunoşe/: ناو. جـاڕوو؛ گەسـک؛ گێـزک؛ گزی ▤ جارو

**کونە**[1] / kune/: ☜ **کوننە**

**کونە**[2]: پێشوشە. ١. کون؛ کونا ‹کونەڕێوی؛ کونەمشک کونەورچ› ٢. پڕ ـ ؛ دارماڵ ‹کونـەژار؛ کونەخەفـەت؛ کونەوەرهەم› ▤ ١. سوراخ ٢. پُر ـ

**کونـەبا** / kuneba/: نــاو. ١. کــــونج، درز یـــان دەمەئەشکەوتێ کە بای بە تەوژمی لێوە دێـت ٢. *[مەجاز]* درۆزنی بە شات و شووت ▤ ١. غاری کە از آن باد می‌وزد ٢. دروغگوی لافزن

**کونەباچکــە** / kunebaçke/: نـــاو. دەربیجـــــە؛ پەنجەرەی بچووک ▤ دریچه

**کونەبەراز** / kuneberaz/: ناو. گەهـ ▤ لانەی گُراز

**کونە پەنیر** / kunepenîr/: ناو. شوێنێ لە چاڵ نانی پەنیری دێ، یان چەن دێ ▤ محـل چـاڵ کـردن پنیر یک یا چند روستا

**کونەجــەرگ** / kunecerg/: ئاوەڵـــناو. *[کینایـــە]* جـەرگ‌دڕاو؛ زووخ‌پـێ‌دراو ‹ئـەم کـوڕە لاسـارە کونەجەرگمی کرد!› ▤ زجرکشیده

**کونەزەهر** / kunezehr/: ئاوەڵناو. ڕکوونی؛ غەرەزن؛ ڕق لە زگ ‹بیوەخشە بچـێ! کونـەزەهر مـەوە!› ▤ کینه‌توز

**کونەلوت** / kunelût/: ناو. گولمەپت ▤ سوراخ بینی

**کونـەڵان** / kunełan/: نـاو. ١. ☜ **کونــدەڵان** ٢.

ئابدارخانــەی دیوەخــان ✉ ١. ☜ کونــدەڵان ٢. آبدارخانه

**کونەڵە / kuneɫe/**: ناو. کونک؛ چەق؛ ناوەڕاست ✉ وسط

**کونــەمشــک / kunemişk/**: نــاو. ســـــیلامیش؛ قولەمشک ✉ سوراخ موش

**کونەمیز / kunemîz/**: ئاوەڵناو. دەڵـەمیز؛ دەڵـەمێز ✉ شاشو

**کــونی / kunî/**: نــاو. کــون دە ئــامرازی کــانزادا ✉ سوراخ در فلز

**کونیلە / kunîle/**: نــاو. ١. کونی زۆر ورد ٢. کــونی بنی موو لە لەشدا ✉ ١. سوراخ بسیار ریز ٢. سـوراخ رویش مو در بدن

**کونیە / kunye/**: ناو. سەرناو؛ نازناو ✉ کُنیه

**کونێر / kunêr/**: ناو. دمەڵ؛ گۆنر؛ دمبەڵ ✉ دُمل

**کونێس / kunês/**: ناو. پاڵ؛ بۆق؛ کاری دەڵەک دان ✉ هُل

**کوە / k(i)we/**: ناو. کێو؛ کەژ؛ چیا ✉ کوه

**کوەک / k(i)wek/**: ☜ کەو ـ١

**کوە / kuh/**: ئاوەڵناو. کول؛ نەتیژ ✉ کُند

**کوهۆ / kuho/**: نــاو. ئــاوی؛ کــەوە ڕەنــگ؛ شــینی عاسمانی ✉ آبی لاجوردی

**کوهۆن / kuhon/**: ☜ کۆن[٢]

**کوی / k(i)wî/**: ناو. کەدوو؛ کدوو ✉ کدو

**کویرمە / k(i)wîrme/**: نــاو. کویرهــە؛ ئاگرخــان ✉ کورەی آهنگر

**کــویروو / k(i)wîrû/**: نــاو. خاڵـــووزە؛ ڕەژەکـــی؛ بەڵایەکی گەنمە، ڕەشی هەڵدەگێرێ ✉ سیاهک آفت گندم

**کویرهە / k(i)wîrhe/**: ☜ کویرمە

**کویزروک / k(i)wîzruk/**: ناو. گیای گۆزروان ✉ گل گاوزبان

**کویژک / k(i)wîjik/**: ☜ کوژە ـ٣

**کویژە / k(i)wîje/**: ☜ کوژە ـ٣

**کویشکە / k(i)wîşke/**: نــاو. کوێشــکە؛ چۆلەکــە ✉ گُنجشک

**کویل / k(i)wîl/**: ☜ کوێل

**کوینک / k(i)wînik/**: ناو. کۆنی ڕەشمــاڵ؛ کــوێنی چادر ✉ پارچەی سیاەچادر

**کویۆ / kuyo/**: ناو. تاوێر؛ بەردی گلارەوەبوو لە کێو و بەرزایی ✉ سنگ غلتان از کوه

**کوێ / k(i)wê/**: جێناو. کام جێ؛ کوێنــە؛ کوێنــا؛ چ شوێنێ؛ وشەی پرسیار بۆ جێگا و ناسینی ‹کاکـە! تۆ کوێت پێ خۆشە؟؛ ڕوو لە کوێ کەم؟› ✉ کجا

**کوێــت / k(i)wêt/**: نــاو. کوێتـــە؛ کێــت؛ ئەســـپی سووری ئاماڵڕەش ✉ کَهَر

**کوێتە / k(i)wête/**: ناو. ١. ☜ کوێــت ٢. *[مەجاز]* ژنی جوان و باڵابەرز و تۆسن ✉ ١. ☜ کوێت ٢. زن رعنا و سرکش

**کوێخا / k(i)wêxa/**: ☜ کەیخودا

**کوێخاحەمدی / k(i)wêxa ĥemdî/**: ناو. جوری ترێ ✉ نوعی انگور

**کوێخاسجیل / k(i)wêxas(i)cîl/**: ناو. سجیل‌نـووس ✉ شناسنامەنویس

**کوێخایانە[١] / k(i)wêxayane/**: نــاو. پیتاکی کوێخــا ✉ باج کدخدا

**کوێخایانـە[٢]**: ئاوەڵـکار. جوامێرانـــە؛ بـــە کـــرداری جوامێران ✉ کدخدامنشانە

**کوێر[١] / k(i)wêr/**: ناو. کۆر؛ کۆرە؛ بێچـاو؛ کەســێ کە هەستی بینایی کار ناکا ‹کـوێر لـە خـودا چـی دەوێ؟ دوو چاوی ساغ! «مەسەل»› ✉ کور

⊡ **کوێر بون:** چاو لە دیتن بێبەش بـوون ✉ کـور شدن

**کوێر[٢]**: ئاوەڵـناو. کـۆر: ١. کـۆرە؛ بـێچـاو؛ نـەوین؛ مجرۆ؛ بێبـەش لـە هەسـتی بینـایی ٢. پـووک ‹گوێزی کوێر› ✉ ١. کور ٢. پوک

▣ **کوێر بونەوە:** ١. کوژانەوە؛ شوێنەوار نەمان ٢. سارێژ بوونی برین ٣. وێران بوون؛ کاول بوونەوە ٤. لە بنەماڵەیەکی گەورە، کەسێکی وا نەمانەوە ▣ ١. ستُرده شدن ٢. التیام یافتن زخم ٣. ویران شدن ۴. از خاندانی بزرگ، شخص برجستەای باقی نماندن

**کوێر کردنەوە:** ١. کوژاندنەوە؛ شوێنەوار نەهێشتن ٢. کاول کردنەوە ▣ ١. ستُردن ٢. ویران کردن

**کوێرەوە بوون:** کۆرەوە بوون: ١. تەمرانی ئاگر ٢. بێسەر و شوێن چوون ٣. دوا بڕان ٤. چۆڵ بوون؛ کەس تێدا نەمان. هەروەها: **کوێرەوە کردن** ▣ ١. خاموش شدن آتش ٢. گُم شدن ٣. مُنقرض شدن ۴. متروک شدن

**کوێر-**[٢]: پێشوشە. بەبێ دڵاوایی (ئاوەڵناو دروست دەکا) ‹کوێرنان؛ کوێرگوان؛ کوێردڵ› ▣ کور -

**- کوێر**[٤]: پاشوشە. ١. نەبین ‹شەوکوێر› ٢. - نەدەر ‹نانکوێر› ▣ ١. - کور ٢. - ندە

**کوێرانە**[١] / k(i)wêrane/: ئاوەڵناو. کۆرانە؛ بە بێ زانین و ئاگایی ‹لە تەتیایی شەوی ژینا، ئەنێم هەنگاوی کوێرانە!/ نییە دەستێ دەرمبێنێ لە ناو ئەم گۆڕە وێرانە «هێمن»› ▣ کورانە

**کوێرانە**[٢]: ئاوەڵکار. کۆرانە؛ کوێرەکوێر؛ کۆرەکۆر؛ وەکوو کوێران ‹چاوبەستیی فەلەک دەستی بڕیم کوێرانە/ خستمیە جەهەندەمێک و ناوی ژیانە «هەژار، چوارینەکانی خەییام»› ▣ کورانە

**کوێراو** / k(i)wêraw/: ناو. کۆراڤ؛ کۆراو؛ کانی کەمئاو ▣ چشمەی کمآب

**کوێرایەتی** / k(i)wêrayetî/: ☜ **کوێریەتی**

**کوێرایی** / k(i)wêrayî/: ☜ **کوێریەتی**

▣ **بە کوێرایی چاوی کەسێک:** *[پلار]* بە کوێری چاوی کەسێک ‹بە کوێرایی چاوی دژمن، لاوەکانمان تێگەیشتوون› ▣ به کوری چشم کسی

▣ **کوێرایی داهاتن:** کۆرایی داهاتن: ١. چاو کۆر بوون ٢. *[کینایە]* لە ڕووداوێک زۆر خەمبار و دڵشکاو بوون ‹کوێراییم داهات کە بەو حاڵە بینیم› ▣ ١. کور شدن ٢. غمگین شُدن

**کوێردڵ** / k(i)wêrdił/: ئاوەڵناو. کۆردل؛ کۆردڵ؛ کەمفام؛ ناتێگەیشتوو ▣ کوردل

**کوێرک** / k(i)wêrik/: ☜ **کوێرو**

**کوێرکوێرانە** / k(i)wêrk(i)wêrane/: ئاوەڵکار. چاوبڕینی بێ بیرکردنەوە ▣ کورکورانە

**کوێرکێش** / k(i)wêrkêş/: ئاوەڵناو. چاوساخ ▣ عصاکش

**کوێرگ**[١] / k(i)wêrig/: ☜ **کوێرو**

**کوێرگ**[٢]: ئاوەڵناو. کێرۆ؛ **تایبەتمەندی گوێزێ کە کاکڵەی بە ئاستەم دەردێ ▣ ویژگی گردویی کە مغزش مشکل در آید**

**کوێرگوان** / k(i)wêrg(i)wan/: ئاوەڵناو. **کەمشیر** (ئاژەڵ) ▣ کمشیر (دام)

**کوێرنان** / k(i)wêrnan/: ئاوەڵناو. کۆرنان؛ نانکوێر؛ نانکۆر؛ ڕژد؛ ڕەزیل؛ چکووس ▣ خسیس

**کوێرو** / k(i)wêrû/: ناو. کورک؛ کوێرک؛ کوێرگ؛ کوێرەک؛ کۆروو؛ کۆرە؛ کوورە؛ کێرۆ؛ کیرۆ؛ ڕەشک؛ زیڤان؛ زیوان؛ زیزانە؛ زیزان؛ ناوی گشتی برێ نەخۆشی قارچی دەغڵ و دان ▣ سیاهک

**کوێرووەڕەقە** / k(i)wêrûweřeqe/: ناو. جۆرێک ئافەتی گەنم ▣ سیاهک گندم

**کوێرە**[١] / k(i)wêre/: ناو. ١. دەنکی بێکاکڵ ٢. چۆنیەتی نەپێکان؛ لە ئامانج نەدان ‹تیرەکەی کوێرەی کرد و ئامانجەکەی نەپێکا› ٣. ڕەوتی دەرنەچوون؛ نەتەقینی فیشەک ▣ ١. دانەی بیمغز ٢. چگونگی به خطا رفتن تیر ٣. فرایند عمل نکردن فشنگ

▣ **کوێرە کردن:** ١. نەپێکان؛ لە ئامانج نەدان ٢. نەتەقینی فیشەک ▣ ١. به هدف نزدن ٢. عمل

نکردن فشنگ

**کوێره ـ**[٢]: پێشوشە. بێ‌فەڕ؛ ناتەوا ‹کوێرەکانی؛ کوێرەچاو؛ کوێرەڕێ؛ کوێرەدێ› ☰ کور ـ

**ـ کوێره**[٢]: پاشەوشە. خاوەن گرفت و کەمایەسی: ١. کەم‌کاکڵ ‹گوێزەکوێره› ٢. ناڕوون و تێک‌چرژاو ‹گرێ‌کوێره› ٣. کز و کەم‌تین ‹کولەکوێره› ☰ مُشکل‌دار: ١. کم‌مغز ٢. بُغرنج ٣. ضعیف

**کوێرەچاو** / k(i)wereçaw/: ناو. قووڵکەی ژێر چاوی پەز ☰ گودی زیر چشم گوسفند

**کوێرەدمەڵ** / k(i)wêred(i)meł/: ناو. کوێرەکوان؛ جۆرێک زیپکەی گەورەی بەژانە، دەرکی نابێ ☰ نوعی دُمل چرکی بسته

**کوێرەدەرە** / k(i)wêredere/: ناو. کۆرەدەرە؛ دۆڵ و شیوێ کە تەنیا لە بەهاران ئاوی هەیە ☰ درّەای که فقط در بهار آب دارد

**کوێرەدێ** / k(i)wêredê/: ناو. کۆرەدێ؛ دێی چەپەک و پچووک ☰ کورەده

**کوێرەڕێ** / k(i)wereřê/: ناو. کۆرەڕێ؛ کۆرەڕا؛ کوورەڕێ؛ ڕچە؛ بزنەڕێ؛ ولاخە ڕێ ☰ کورەراه

**کوێرەک** / k(i)wêrek/: ناو. ١. ☜ کوێرو ٢. کوێرەی دەنک ☰ ١. ☜ کوێرو ٢. دانەی بی‌مغز

**کوێرەکانی** / k(i)wêrekanî/: ناو. کانییەک کە هەر بەهاران ئاوی هەیە ‹کوێرەکانی بە باخ مەکە! «مەسەل»› ☰ چشمەی فصلی

**کوێرەکوان** / k(i)wêrek(i)wan/: ☜ کوێرەدمەڵ

**کوێرەکوێر** / k(i)wêrek(i)wêr/: ئاوەڵکار. کوێرانە؛ کۆرانە؛ کۆرەکۆر؛ وەکوو کوێران ☰ کورانه

**کوێرەمار** / k(i)wêremar/: ناو. کۆرە مار؛ جۆرێ ماری بۆر ☰ نوعی مار خاکستری

**کوێرەمرە** / k(i)wêrem(i)re/: ناو. ئاوری بە تەپاڵە و پردووکەڵ ☰ آتش پُردود

**کوێرەمووشە** / k(i)wêremûşe/: ئاوەڵناو. *[پ‍ـلار]* چاوپرووش ‹کابرایەکی کوێرەمووشە بوو، دەوروبەری خۆی نەدەدیت!› ☰ دارای چشم کم‌سو

**کوێرەوەری** / k(i)wêrewerî/: ناو. کۆرەوەری؛ ئەرک و دەردی زۆر ☰ درد و رنج

**کوێری** / k(i)wêrî/: ☜ کوێریەتی

**کوێریشک** / k(i)wêrîşk/: ☜ کەرویشك

**کوێریەتی** / k(i)wêryetî/: ناو. کوێرایەتی؛ کوێرایی؛ کوێری؛ کوێریتی؛ کۆرایی؛ کۆری ☰ کوری

**کوێریتی** / k(i)wêrêtî/: ☜ کوێریەتی

**کوێڕا** / k(i)wêřa/: ئاوەڵکار. چزوو؛ چماوە بلەز ☰ چقدر زود

**کوێزر** / k(i)wêzir/: ☜ کۆزرە ـ٢

**کوێژکە** / k(i)wêjke/: ناو. چۆلەکە؛ چوێلەکە ☰ گُنجشک

**کوێژیلە** / k(i)wêjîle/: ناو. چۆلەکە؛ چوێلەکە ☰ گُنجشک

**کوێسان** / k(i)wêsan/: ☜ کوێستان

**کوێستان** / k(i)wêstan/: ناو. کوێسان؛ کۆیوسان؛ کۆستان؛ کێفساران؛ کێوسان؛ کێفسان؛ کێوستان: ١. سەردەسێر؛ زۆزان ٢. کێوسار؛ کێولان؛ کۆسار؛ جێ و شوێنێ کێوی زۆری تێ هەڵکەوتبێ و دەشتایی نەبێ ☰ ١. سردسیر ٢. کوهسار؛ کوهستان

**کوێستانچی** / k(i)wêstançî/: ناو. هاڤینڤان ☰ ییلاق رو

**کوێستانۆکە** / k(i)wêstanoke/: ناو. زۆزک؛ هەوارگەی پچووک ☰ ییلاق کوچک

**کوێستانی** / k(i)wêstanî/: ئاوەڵناو. شاخاوی؛ کێفسانی ☰ کوهستانی

**کوێشتیر** / k(i)wêştîr/: ناو. توێشتیر؛ چێشتیر؛ چویشتیر؛ بزنی دووسالان ☰ بُز دوساله

**کوێشکە** / k(i)wêşke/: ناو. ١. لکی بن گڵ خراو بە بێ برین ٢. ☜ کویشکه ☰ ١. شاخه زیر خاک

خوابیدەی درخت ۲. ☜ کویشکە

**کوێڵ / k(i)wêl/**: ناو. گوێرەکە؛ گچـە؛ گوسـاڵ ☰ گوساله

**کوێن / k(i)wên/**: ناو. کێن؛ پارچەی ڕەشماڵ ☰ پارچەی سیاهچادر

**کوێنا / k(i)wêna/**: ☜ کوێ

**کوێنە / k(i)wêne/**: ☜ کوێ

**کوێوە / k(i)wêwe/**: ئاوەڵکار. بەرەو کوێ؛ بە کـام جێگادا ‹ئەرێ ئەوە کوێوە چووی وا لە بـەر چاومـان ون بووی؟› ☰ کجا

**کۆ[1] / ko/**: ناو. ۱. زۆر شت پێکەوە ‹کـۆی ڕەقـەمی بووجە؛ کـۆی بەڵـگەکان› ۲. پێـروو؛ پـیرۆ؛ پێـور؛ پـەروین؛ سـوورەییا؛ ئەسـتێرەی کـۆ؛ ئەسـتێرە شەشانەکەی ئاسمـان ۳. نەخۆشـییەکی چـاوی ئاژەڵە ٤. تۆپەڵی خەرمانی سوور ٥. کێـف؛ چیـا ٦. سڵی؛ ڕەوەکی ‹ئەسپەکەم فێر بووە کـۆ دەکـا› ۷. کوڵ؛ خەم؛ خەفەت ۸. جفات؛ چۆنیەتی لێک خـڕ بوونـەوە ۹. ☜ کـەوە ☰ ۱. جمـع ۲. ثُریـا؛ خوشەی پـروین ۳. نـوعی بیمـاری چشـم احشـام ۴. تودەی خرمن پاک کردە ۵. کوە ۶. رموکی ۷. اندوە ۸ اجتماع ۹. ☜ کەوە

⊡ **کۆ بونەوە**: کۆوە بوون؛ کۆڕ گـرتن؛ لێـک خـڕ بوونەوە ‹ئـاوێکی زۆر لـە پشـتی ئـەم بەنـدە کـۆ بۆتەوە› ☰ جمع شدن؛ اجتماع کردن

**کـۆ خـواردن**: ڕاچڵــەکین؛ داچڵــەکین ☰ یکّـە خوردن

**کۆ کردن**: ۱. سـڵ کـردن؛ سڵـەمینەوە ۲. خـڕ کردنەوەی بڵاو ۳. لە سـەر یـەک دانـان ☰ ۱. رمیدن ۲. جمـع کـردن اشـیای پراکنـدە ۳. بـرهم انباشتن

**کۆ کردنەوە**: خڕ کردنەوەی پرژ و بـڵاو ☰ جمـع کردنِ پراکندە

**کۆ گرتن**: پەرە سەندن و ڕوو لـە زۆری نـان ‹بـا بەس بێ سەلەم کردنی ناو هۆبە و خێڵت/ ڕاستی کەرەوە فیکری دڵی چەوت و چەوێڵت/ لـە خـوام گەرەکە کۆ نەگرێ گەنجی دووکانـت «قـانع»› ☰ جمع شدن و توسعە یافتن

**کـۆ لـە کەسـێ/ شـتێک نەکردنـەوە**: لــە کەســێ/ شــتێک نەترسـان؛ کەسـێ/ شـتێ بـە هـیچ حیساب نەکردن ‹منداڵی ئەم زەمانە لە بابیشـی کۆ ناکاتەوە!› ☰ از کسی/ چیزی حساب نبردن

**کۆوە بون**: ☜ کۆ بونەوە

**کۆ[2]**: ئاوەڵناو. ۱. کوڵ؛ نەبـڕ؛ دژی تیـژ ۲. سـرک؛ سڵ؛ ڕەوەک ☰ ۱. کُند ۲. رموک

⊡ **کۆ بـون**: ۱. کول بـوون ۲. سـڵ بـوون؛ قـوت بوون؛ سرک بـوون ☰ ۱. کُنـد بـودن ۲. رمـوک بودن

**کۆ[3]**: ئاوەڵکار. بەڵکە؛ شایەتا ☰ بلکە؛ شاید

**کۆ[4]**: جێناو. کوێ؛ کوێنە ‹بۆ کۆ بچم؟› ☰ کُجا

**کۆ ـ[5]**: پێشەوشە. سـەرجەم ‹کۆئەنـدام؛ کۆبازێـڕ› ☰ جمع

**ـ کۆ[6]**: پاشەوشە. ـ کوت ‹سەرکۆ› ☰ ـ کوب

**ـ کۆ[7]**: پاشگر. گچکە ‹لاوکۆ؛ حەسەنکۆ› ☰ ـ ک

**کۆ[8]**: پێرۆ. ← کوڵوکۆ/ تەپوکۆ

**کۆئەندام / ko'endam/**: ناو. کۆمەڵێک شت، ماک یان کەسان کە بە هاوگری و هاوکاری یەکتر، بـە شێوەی سەرجەم، کار یان کارگەلێکی دیـاریکراو بەڕێوە دەبەن ☰ دستگاه

⊡ **کۆئەنـدامی دەمـار**: تـۆڕێکی ئاڵـۆز لـە خانـە دەمارییەکان بۆ کـۆنترۆڵ کـردن و پاراسـتنی هاوسـەنگی چالاکییـەکانی لـەش ☰ دسـتگاه عصبی

**کۆئەندامی زاوزێ**: کۆمەڵێک ئەنـدامی گیانـەوەر کـە پێکـرا کـار دەکـەن بـۆ دروسـت کـردنی گیانەوەرێکی نوێ لە خۆ ☰ دستگاه تناسلی

**کۆئەندامی سوڕانی خوێن**: کۆئەنـدامی سـووڕانی

خوێن و لیمف لە لەشی مرۆڤدا دستگاه گردش خون

**کۆئەندامی میز:** کۆئەندامی تایبەتی بۆ پالاوتنی خوێن و دەردان و دەرکردنی میز لە لەشدا دستگاه ادراری

**کۆئەندامی هەرس:** کۆندامێک بریتی لە دەم، گەروو، گەدە، ڕیخۆڵە، جەرگ و زراو کە هەڵتاوینی خۆراکی لە ئەستۆدایە دستگاه گوارش

**کۆئەندامی هەناسە:** کۆئەندامی دابین کردنی ئۆکسیژنی خانەکانی لەش و دەرکردنی دووئۆکسیدی کەربونی بەرهەم هاتوو لە پرۆسەی میتابولیسم لە لەشدا دستگاه تنفسی

**کۆبازێڕ** / kobajêř/: ناو. بازاڕی بە شەریکی چەن کەس یان چەند وڵات بازار مُشترک

**کۆبایی** / kobayî/: ناو. نرخی بەجوملەفرۆشی نرخ عمده‌فروشی

**کۆبڕ** / kobiř/: ناو. کۆخڕ؛ کار و ڕەوتی بە کۆمەڵ بڕین یان ڕێکوپێک کردنی کارێک (بەتایبەت لە فیلم و کاری هونەریدا) تدوین

**کۆبوونەوە** / kobûnewe/: ناو. کۆڕ؛ جڤات ‹تا پرتەقاڵ و مۆز و سێو مابن/ کۆبوونەوەکان قەت تەواو نابن! «پەشێو»› همایش؛ گردهمایی

**کۆبە** / kobe/: ناو. قەراغی دادرواو سجاف

**کۆبەش** / kobeş/: ناو. بەشدارگە؛ هاوبەشگە؛ شەریکە شرکت

**کۆپ** / kop/: ناو. ۱. دوندی چیا؛ ترۆپکی کەژ ۲. بالاترین شوێن ۱. قُلەی کوه ۲. اوج

⊡ **کۆپا بەخت:** ئەو پەڕی بەختەوەری نهایت خوشبختی

**کۆپار** / kopar/: ناو. ۱. کۆپاڵ؛ گۆپاڵ؛ تێلای سەر ئەستوور ۲. گۆپار؛ گۆپارە؛ گۆچان ۳. کۆپارە؛ کۆپانە؛ پێڵ؛ دووگ؛ ملک؛ هەنج؛ زۆپی گۆشتی لە سەر پشتی تاقمێ گوهانداری گەورە (وەک: وشتر، مانگا، واڵ) کە زۆرتر چەوری و ئاوی تێدا کۆ دەبێتەوە ۱. چُماق ۲. عصا ۳. کوهان

**کۆپارە** / kopare/: ناو. ۱. زۆپایی ملی گا ۲. ناو چیا ۳. ☜ **کۆپار-۳** ۱. برآمدگی پشت گردن گاو ۲. کوهساران ۳. ☜ **کۆپار-۳**

**کۆپاڵ** / kopał/: ناو. ۱. کۆپار؛ گۆپاڵ؛ تێلای سەر ئەستوور ۲. گۆچان؛ داردەستی سەر چەماو ۱. چُماق ۲. عصا

**کۆپان** / kopan/: ☜ **کورتان**

⊡ **کۆپان کردن:** ۱. گورج کردنەوەی چارەوێ ۲. *[کینایە]* کەسێ بە ئارەزووی خۆ سووڕاندنەوە ۱. پالان بستن بر مرکب ۲. کسی را مطیع و مُنقاد خود ساختن

**کۆپان گرتنەوە:** داکەندنی کۆپان لە پشت بارەبەر ‹کۆپانەکەی بگرەوە با پیشێ بات› پالان برداشتن از پشت مرکب

**کۆپاندۆز** / kopandoz/: ☜ **کۆپاندوور**

**کۆپاندوور** / kopandûr/: ناو. کۆپاندۆز؛ کورتاندوور پالاندوز

**کۆپانە** / kopane/: ناو. ۱. زەقایی پشتەملی گا ۲. جۆرێ نەخۆشی ولاخە بەرزە ۳. تیسکە خوری سەر پشتی حەیوان کە بۆ جوانی نایبڕنەوە ٤. ☜ **کۆپار-۳** ۱. برجستگی پشت گردن گاو ۲. نوعی بیماری ستور ۳. پشمی کە بر پشت گوسفند می‌ماند و چیده نمی‌شود ۴. ☜ **کۆپار-۳**

**کۆپرسان** / kopirsan/: ☜ **گشپرسی**

**کۆپک** / kopik/: ناو. پێڵووی چاو پلک چشم

**کۆپلەن** / koplen/: ☜ **گوبلەن**

**کۆپڵ** / kopił/: ئاوەڵناو. لاواز و داڵگۆشت لاغر مُردنی

**کۆپە** / kope/: ئاوەڵناو. گەوج؛ گەمژە ابلە

**کۆپەڕ / kopeř/**: ناو. پووشپەڕ؛ جەنگەی گیادروون ≡ موسم درو گیاه

**کۆپەڕە / kopeře/**: ناو. ئەستوورایی دەورەی شت ≡ ضخامت پیرامونی

**کۆپەک / kopek/**: ناو. ١. بەری دار بەڕوو ٢. کۆپ؛ ترۆپکی چیا ٣. قارەمان ≡ ١. ثمر بلوط ٢. قلەی کوه ٣. قهرمان

**کۆپەل / kopel/**: ناو. کاری بەستن و توند کردن ‹ئەو دەروازەیە کۆپەل کە! با کەس نەچێتە ژووری›.

هەروەها: **کۆپەڵ کردن** ≡ عملِ بستن

**کۆپەڵان / kopełan/**: ☜ **کورتان**

**کۆپەڵێن / kopełên/**: ☜ **کورتان**

**کۆپەنیگ / kopenîg/**: ناو. سەرگوێلک ≡ سرگینگاه

**کۆپی / kopî/**: ناو. ڕایش؛ ڕۆنفیس؛ قۆپی ≡ کُپی

⊡ **کۆپی کردن**: ڕایش کردن؛ لە ڕووی شتێک نووسینەوە، کێشان یان چاپ کردن ≡ کُپی کردن

**کۆپیتە / kopîte/**: ناو. پۆپە (پەلەوەر) ≡ تاج (پرنده)

**کۆپیڕایت / kopîřayt/**: ناو. مافی کۆپی؛ مافی بەدیهێنەر بۆ کەڵک گرتن لە ئاسەوارەکەی (هونەری، وێژەیی یان پیشەیی) ≡ کُپیرایت

**کۆت**[١] **/ kot/**: ناو. ١. پاسەوان؛ چاودێر ٢. داری ئەستووری قاچی زیندانی ٣. بن خەرمان ٤. داری ئەستوور بۆ ملی گا و کەڵی غلوور ٥. جلکی لە پشتێن بەرەژووری ئورووپایی ٦. گۆرانی و لاوکی بە سۆزە ٧. چەپەر؛ درگای لە شووڵ چنراو ٨. کوود؛ کووت ≡ ١. پاسبان ٢. کندەی پای زندانی ٣. ته خرمن ۴. کندەی آویزان به گردن حیوان یاغی ۵. کُت ۶. آواز حزین ۷. پرچین ۸. کود

⊡ **کۆت کرن**: بە سۆزە گۆرانی وتن ≡ آواز حزین خواندن

**کۆت**[٢]: ئاوەڵناو. قۆت؛ سەر بێ کڵاو ≡ بی‌کلاه

**کۆت**[٣]: پێرۆ. ← **کاوکۆت**

**کۆتا / kota/**: ئاوەڵناو. ١. کورت؛ کوڵ ٢. هاڕدراو؛ وردکراو ≡ ١. کوتاه ٢. خُردشده

⊡ **کۆتا بوون**: ١. کورت بوون ٢. خەلاس بوون ≡ ١. کوتاه بودن ٢. پایان یافتن

**کۆتا بوونەوە**: کورت بوونەوە ≡ کوتاه شدن

**کۆتا کردن**: بڕینەوە؛ بەس کردن ‹ئەم قسەوباسە کۆتا کە! چیتر بایەخی نەماوە› ≡ بس کردن

**کۆتا کردنەوە**: نزم کردنەوە؛ کوڵ کردنەوە ≡ کوتاه کردن

**کۆتا هاتن**: ١. کنک بوون؛ پێ نەگەیشتن ٢. کەمتەرخەمی کردن ٣. بڕینەوە؛ درێژە پێ نەدان؛ تەواو کردن ≡ ١. کوتاه بودن ٢. کوتاهی کردن ٣. کوتاه آمدن

**کۆتاسی / kotasî/**: ناو. کۆتایی؛ دوماهی؛ ئاخری ≡ پایان

**کۆتاک / kotak/**: ناو. پەچەمەڕ؛ هەوارەمەڕ؛ کۆتان ≡ شبغاز؛ خوابگاه گله در دشت

**کۆتاڵ / kotał/**: ناو. پاتاڵ؛ ماڵات ≡ دام اهلی

**کۆتاڵە / kotałe/**: ئاوەڵناو. باوەعەمرە؛ چلەنۆک ≡ کوتوله

**کۆتان**[١] **/ kotan/**: ناو. ١. کۆتانک؛ زنج ٢. جێ پووشوپاری پاوان ٣. دارێکە لە ملی گای غلووری دەکەن ٤. جووت بە چەن جووتەگا ٥. کۆتاک؛ پەچەمەڕ؛ هەوارەمەڕ ≡ ١. حصار ترکه‌ای برای نگهداری دام ٢. مرتع خصوصی ٣. کندەی گردن گاو ۴. شخم با گاوهای متعدد ۵. شبغاز

**کۆتان**[٢]: ئاوەڵناو. زۆر سەخت لە کێڵان (زەمین) ≡ سخت در شخم زدن (زمین)

**کۆتاهی / kotahî/**: ☜ **کۆتایی**

**کۆتایی**[١] **/ kotayî/**: ناو. کۆتاهی: ١. کنکی؛ کوڵی؛ پێچەوانەی درێژی ٢. کەمتەرخەمی؛ قسوور ٣. کورتی و موختەسەری ٤. دوایی؛ کۆتاسی؛ سەرەنجام ‹هەوای کۆتایی ناڵەی وێت بییەن/ وە

تیرێ هەنی ئاگاهیت نییەن «مەولەوی»» ≡ ۱و۲. کوتاهی ۳. اختصار ۴. سرانجام

▣ **کۆتایی (پێ) هاتن:** دوایی هاتن؛ کۆتا بوون. هەروەها: **کۆتایی (پێ) هێنان** ≡ پایان یافتن

**کۆتایی**[۲]: ئاوەڵناو. ئاخری؛ سەرەنجامی ‹عومری کۆتایی؛ ژیانی کۆتایی› ≡ نهایی؛ پایانی

**کۆتر**[۱] / kotir/: ناو. کابۆک؛ کاپۆک؛ کافۆک؛ کاواتر؛ کاوتر؛ کاوەتر؛ کاوەتری؛ کواتر؛ کەبۆتەر؛ کەفتەر؛ کەڤۆک؛ کەڤوک؛ کەمووتەر؛ کوتر؛ کەبووتک؛ گۆگەرجین؛ کەمۆتەر؛ کەمووتر؛ کەبووتەر؛ کەواتر؛ کەواتری؛ کەوتەر؛ گۆتر؛ بەهێڤ؛ کۆتریک؛ تۆرەمەیەک باڵندەن بە باڵ و کلکی تا ڕادەیەک درێژ و ملی قوڵەوە کە نێر و مێیان هاوشێوەیە و لە سەر دار یان کونەبەردان هێلانە دەکەن. چەن جۆریان هەیە: قومری، کوترەباریکە، کۆترەگایە، کۆترەشینە و... ≡ کبوتر

▣ **کۆتری ماڵی:** کۆتری دەستەمۆ کە لە ئاوەدانیدا دەژی ‹شوکور ئیستاکە کووکوومە بە چەشنی کۆتری ماڵی/ کەوای پەستی و نەزانینم دڕی و یەکدەفعە دامماڵی «قانع»› ≡ کفتر خانگی

**کۆتر**[۲]: ئاوەڵناو. کۆتا؛ کورت ≡ کوتاه

▣ **کۆتر هاتن:** کۆتا هاتن؛ کۆتا بوون ≡ پایان یافتن

**کۆتراش** / kot(i)raş/: ناو. ١. ڕەوتی هەڵکڵۆشانی منداڵدان و لەبار بردن و دەرهێنانی منداڵ بە دەزگا ٢. خۆتراش؛ دەزگای ڕیش تاشین ≡ ١. کورتاژ ٢. ماشین ریش‌تراش

**کۆترباز** / kotirbaz/: ناو. کەبۆتەرڤان؛ خاوەن هۆگرەتی و خواستی بەخێو کردنی کۆتر ≡ کبوترباز

**کۆترخان** / kotirxan/: ناو. کۆترخانە؛ بۆرانخانە؛ لیس؛ هۆدە یان ژوورێک کە بۆ کۆتران سازی دەکەن ≡ کبوترخان

**کۆترخانە** / kotirxane/: ☜ **کۆترخان**

**کۆترۆکە** / kotroke/: ناو. دەرزیلەی قژ و بەر دەسماڵی ژنان ≡ کلیپس

**کۆترە** / kotre/: ناو. ١. کاریتە؛ دیرەک؛ باڵار؛ داری دارەڕا ٢. کۆماجە؛ داری نێوان ئەستوندەک و داری سەربان ≡ ١. دیرک ٢. چوب رابط ستون و دیرک بام

**کۆترەباریکە** / kotrebarîke/: ناو. کۆترەبانجیلە؛ کۆترەبەرجیلە؛ کوڕک؛ کۆڤۆ؛ کۆڤۆکرک؛ کەڤۆکرک؛ کوکوو؛ جۆرێک کۆترە بە درێژایی نزیک ٢٧ سانتی‌میتر و لەشی باریک، کلکی نەختێک درێژ و مەیلەو ڕەش، پشتی شێ ڕەنگی تێکەڵ بە پەڕی ڕەش، تووکی ملی ڕەشبەڵەک و ملی شەڕابییەوە، لە سەر دار هێلانە ساز دەکا و هاوینان زۆرە ≡ قُمری

**کۆترەباڵبازوو** / kotrebałbazû/: ☜ **کۆترەگایە**

**کۆترەبانجیلە** / kotrebancîle/: ☜ **کۆترەباریکە**

**کۆترەبەرجیلە** / kotrebercîle/: ☜ **کۆترەباریکە**

**کۆترەپەپوو** / kotrepepû/: ناو. کوکوکنەک؛ تۆرەمەیەک باڵندەن، زۆرتر لە سەر دار دەژین، قاپۆڕیان باریک، کلکیان درێژ، دندووکیان ئەستوور و دوو قامکیان لە پێشەوە و دووشیان لە دواوەیە، بە تەنیا دەژین، لە هێلانەی باڵندەکانی‌تردا هێلانە دەکەن، سێ جۆریان هەیە: کۆترەپەپووی ئاسایی، جغەڕەش و خاڵخاڵ ≡ کوکو

**کۆترەپەڵخی** / kotrepełxî/: ☜ **کۆترەگایە**

**کۆترەچایی** / kotreçayî/: ☜ **کۆترەشینە**

**کۆترەسەیدە** / kotreseyde/: ☜ **کۆترەشینە**

**کۆترەسەیی** / kotreseyî/: ☜ **کۆترەشینە**

**کۆترەشاخە** / kotreşaxe/: ☜ **کۆترەشینە**

**کۆترەشاخی** / kotreşaxî/: ☜ **کۆترەشینە**

**کۆترەشینکە** / kotreşînke/: ☜ **کۆترەشینە**

**کۆترەشینە / kotreşîne/**: ناو. کۆترەچاییی؛ کۆترەسەیدە؛ کۆترەسەیی؛ کۆترەشاخە؛ کۆترەشاخی؛ کۆترەشینکە؛ کۆترەکێفی؛ کۆترەکێوی؛ کۆترەکێویلە؛ جۆرێک کۆترە نزیک ۳۲ سانتیمیترە، ئاتەگی سپییە، لەشی شینبۆرە، خەتی ڕەش و سپی بە درێژایی باڵیدا هاتووە، سەر کلکی ڕەشە، لاقی سوورە، لاجانگی سەوزی بنەوشە، لە ئەشکەوت و کونەبەردانا هێلانە ساز دەکا 🇮🇷 کبوتر چاهی

**کۆترەکێفی / kotrekêfî/**: ☜ **کۆترەشینە**

**کۆترەکێوی / kotrekêwî/**: ☜ **کۆترەشینە**

**کۆترەکێویلە / kotrekêwîle/**: ☜ **کۆترەشینە**

**کۆترەگایانە / kotregayane/**: ☜ **کۆترەگایە**

**کۆترەگایلکە / kotregayilke/**: ☜ **کۆترەگایە**

**کۆترەگایە / kotregaye/**: ناو. کۆترەباڵبازوو؛ کۆترەپەڵخی؛ کۆترەگایانە؛ کۆترەگایلکە؛ گاپل؛ گاکۆتر؛ گایە؛ گاکەمووتەر؛ پەڵخی؛ چەلەکوری؛ ئوورکووتک؛ کۆترێکی نزیک ٤٠ سانتیمیترە، گەردەنی شەڕابییە، دەورەیان کەسک و ئەرغەوانییە، بە پۆل دەگەڕێن، لە هەموو شوێنێک دەبینرێن 🇮🇷 کبوتر جنگلی

**کۆترەنەخشینە / kotrenexşîne/**: ☜ **کوکوختی**

**کۆتریک / kotrîk/**: ☜ **کۆتر**[1]

**کۆتش / kotiş/**: چاوگ. ۱. کرتاندن؛ کرماندن (وەک: مشک) ۲. کەوتن؛ کەفتن 🇮🇷 ۱. خاییدن ۲. اُفتادن

**کۆتک / kotik/**: ناو. ۱. ڕبە؛ کاسەی دارینی زل کە چوار کیلۆ و نیو گەنم دەبا ۲. کەشکەک؛ کەسکەژنۆ؛ پێشەی سەر زرانی ۳. جامۆلە؛ پیاڵە؛ دەفری بچووکی قووڵ 🇮🇷 ۱. کاسەی بزرگ چوبی بە گنجایش چهار کیلو و نیم گندم ۲. کاسەی زانو ۳. پیالە

**کۆتکە / kotke/**: ناو. بایەی زل و فرەوان 🇮🇷 کاسەی چوبین بزرگ و گُشاد

**کۆتل / kotil/**: ناو. کۆتەڵ؛ ئەسپێ کە لە تازیەدا دەیگێڕن 🇮🇷 اسبی کە در عزاداری می‌گردانند

**کۆتمە / kotme/**: ناو. داری گەورە بۆ سووتاندن 🇮🇷 کُندەی هیزمی

**کۆتن / kotin/**: چاوگ. ۱. کرووساندن؛ کراندنەوە ۲. ☜ **کورۆژتن** 🇮🇷 ۱. زدودن (گوشت از استخوان و...) ۲. ☜ **کورۆژتن**

**کۆتنای / kotnay/**: ☜ **کەواندن**

**کۆتوزنجیر / kot û zincîr/**: ناو. پاونە؛ پێوەند 🇮🇷 کُند و بند پای زندانی

**کۆتە / kote/**: ناو. ۱. قەدی دار ۲. کۆتی قاچی زیندانی ۳. دارێکە قەساب گۆشتی لە سەر ورد دەکەن ‹ئەر یادم بشێ، یاد مەرگم بۆ/ چون کۆتەی قەساب، لەت ـ لەت جەرگم بۆ «عومەر زەڵمی»› ٤. دەزگای پینەچی 🇮🇷 ۱. تنەی درخت ۲. کُندەی پای زندانی ۳. تختەساطور قصاب ۴. دست‌افزار کفشدوز

**کۆتەدار / kotedar/**: ناو. بەژنەدار 🇮🇷 تنەی درخت

**کۆتەر**[1] **/ koter/**: ناو. ۱. گەردانە؛ گەردەنبەند؛ ملوانەی خشڵ ۲. ئەستوورایی دار ۳. کۆترەکێویلە ٤. ☜ **کۆتەرە**[1]**ـ۳** 🇮🇷 ۱. گردنبند زینتی ۲. تنەی درخت ۳. کبوتر چاهی ۴. ☜ **کۆتەرە**[1]**ـ۳**

**کۆتەر**[2]: ئاوەڵناو. ۱. قرتاو؛ کورتەوەکراو (وەک: کاکۆڵ) ۲. قرخ؛ کەم‌پشت (وەک: مووی سەر) 🇮🇷 ۱. بُریدە (کاکل) ۲. کم رشد (موی سر)

**کۆتەرازوو / koterazû/**: ناو. پێروو؛ پیرۆ؛ پێور؛ پەروین؛ پۆلێک‌ئەستێرە؛ ئەستێرەی کۆ؛ ئەستێرە شەشانەکەی ئاسمان 🇮🇷 خوشەی پروین

**کۆتەرگە / koterge/**: ناو. [کینایە] گەردنی پڕ خشڵ و خەمڵ 🇮🇷 گردن پر از زیورآلات

**کۆتەرە**[1] **/ kotere/**: ناو. ۱. کۆتە؛ قەدی دار ‹کۆتەرەی ئەو دار خورمایەش بهەژێنە! خورمای تازە

پێ‌گەیشتووت بە سەردا دادەوەرێنێ «هەژار، *قورئان*» ٢. پارچە داری ئەستوور ٣. کۆتەر؛ لەتە هێڵێک لە نێوان دوو سەری لێک دووری چەن گۆشە یان چەن پاڵوویەک ٤. بزووت؛ سەلکەبزووت؛ چلووسک ☰ ١. تنەی درخت ٢. کُنده ٣. قُطر ۴. نیمسوز

**کۆتەرە**[2]: ئاوەڵناو. ١. لاسووتاو؛ نیوەسووتاو ٢. باڵ قەیچی‌کراو (باڵندە) ٣. کورت؛ کۆتا؛ ناتەواو ☰ ١. نیمسوخته ٢. بال قیچی شده (پرنده) ٣. ناقص

⊡ **کۆتەرە بوون**: ڕووت بوونەوەی دار و گەسک ☰ ریختن برگ درختان

**کۆتەرە**[3]: سارستە. دەستەواژەی یاری هەلووکان، لە کاتێکدا دەگوترێ کە یاریکەرێ هەلووکەکە نەپێکی ☰ اصطلاحی در بازی الک‌دولک

**کۆتەرەدار** / koteredar/: ناو. کۆڤڵ؛ پادار ☰ کُندەی درخت

**کۆتەری** / koterî/: ناو. جۆرێ گندۆرەی شیرین ☰ نوعی خربُزەی شیرین

**کۆتەشکێن** / koteş(i)kên/: ناو. ئەستێولکێ کە داری نیوە سووتاوی پێ هەڵگێڕ- وەرگێڕ دەکەن ☰ انبُرک

**کۆتەک** / kotek/: ئاوەڵناو. زۆردار؛ زۆربێژ ☰ زورگو

**کۆتەکی** / kotekî/: ئاوەڵکار. بە زۆری؛ بە ملهوڕی ☰ با گردن کلفتی

**کۆتەڵ**[1] / koteł/: ناو. ١. دۆلاشی لە بەرد ٢. دۆلاش بە گشتی ٣. کوتەڵ؛ سەرکۆزەر؛ گولەخەلەی بەر گێرە نەکەوتووی درشت ٤. پەیکەر بۆ مردگی ئازیز ‹ببێ بە مایەی سەربەرزیی کۆمەڵ/ بۆی دروست بکەن پاش مردن کۆتەڵ «هێمن»› ٥. کۆتڵ؛ ئەسپێ کە لە تازیەدا دەیگێڕن ٦. پەیکەر؛ موجەسەمە؛ وێنەی مرۆڤ، گیا و گیانەوەر کە لە ماکێک داڕێژرابێ ☰ ١. ناو سنگی آسیا ٢. ناو آسیا ٣. خوشەهای خُرد نشده ۴. پیکر ۵. اسبی که در مراسم عزاداری می‌گردانند ۶. مُجسمه

**کۆتەڵ**[2]: ئاوەڵناو. ١. خڕکەڵە و جوانکیلە ٢. چوغور (دارستان) ☰ ١. تُپُل ـ مُپُل ٢. انبوه (جنگل)

⊡ **کۆتەڵ بون**: قەڵەو و بەکەیف بوونی زارۆک ☰ چاق و شاداب بودن کودک

**کۆتەڵتاش** / kotełtaş/: ناو. پەیکەرتاش ☰ پیکرتراش

**کۆتی**[1] / kotî/: ناو. ١. بەرەس؛ بەڵەکی ٢. خوەرە؛ گولی ☰ ١. برص ٢. جُذام

**کۆتی**[2]: ئاوەڵناو. */پلار/* ١. پیس؛ چەپەڵ ٢. بێ‌ئاکار؛ بێ‌فەڕ ☰ ١. کثیف ٢. مُبتذل

**کۆتی**[3]: ئاوەڵکار. لە کوێ؛ کوێنە ☰ کجا؛ از کجا

**کۆتی**[4]: جێناو. بۆ کوێ؛ کوێنا ☰ کجا؛ به کجا

**کۆتیان** / kotyan/: ☜ **کورۆژیان**

**کۆتیکۆ** / kotîko/: ناو. قسەی سووک ☰ سخن رکیک

**کۆتیلە** / kotîle/: ناو. دەوەنێکە ☰ درختچه‌ای است

**کۆتینای** / kotînay/: ☜ **کەواندن**

**کۆج** / koc/: ناو. ١. قفڵ؛ گۆڵە ٢. ئاڵقەی قفڵ پێدا کردن بۆ داخستن ☰ ١. قُفل ٢. حلقه‌ای که قُفل را در آن کنند

**کۆجەڵە** / kocełe/: ناو. ١. کاسەی چکۆڵەی قووڵ لە دار ٢. کوچەڵە؛ قووڵکە قوڕێ کە بە دارە بەنیوە دەنێن بۆ بنێشت تێچوون ☰ ١. کاسەی چوبی کوچک و ژرف ٢. نیمکاسەی گلی که به درخت بنه می‌چسبانند تا سقز خام وارد آن شود

**کۆجیلە** / kocîle/: ناو. کۆجەڵە؛ کاسەی چکۆڵەی دار ☰ کاسەی کوچک چوبین

**کۆچ**[1] / koç/: ناو. ١. بار؛ کار و ڕەوتی لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی‌تر چوون و بۆ ماوەیەک نیشتەجێ بوون ‹کۆچی کوردان وا بە کاروان دێ لە ڕێی شارانەوە/ ڕۆژ بە باری قورس و برسی، شەو لە

بەر بارانەوە «شەریف»› ٢. /کینایە/ مەرگ؛ دۆخی نەمان؛ لە دنیا دەرچوون ‹کۆچ بێوادەت کارێ پێم کەردەن/ بێزارم جە گیان، ڕازیم وە مەردەن «ئەحمەد بەگی کۆماسی»› ٣. کاری کوتن؛ وتن؛ ئاخافتن ٤. بڕشتێ لە داری ئەستوور ٥. ☜ کۆچوبار ☰ ١. کوچ ٢. مرگ ٣. عمل گفتن ۴. بُرشی از کُندەی درخت ۵. ☜ کۆچوبار

▣ **کۆچی دوایی:** /کینایە/ کارەڕەهاتی مردن ☰ مرگ

▣ **کۆچ کردن:** ١. لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر چوون و بۆ ماوەیەک نیشتەجێ بوون ٢. /کینایە/ مردن؛ لە دنیا دەرچوون ‹کاتی کۆچ کردنە، وەختی سەفەرە/ داخەکەم سەختی نەمانم لەبەرە «سوارە»› ☰ ١. کوچ کردن ٢. از دنیا رفتن

**کۆچ**[٢]: ئاوەڵناو. ١. کوچ؛ شەپلەلێداو ‹کۆچ بوون› ٢. قوت؛ کوت؛ کوتەر؛ بێشاخ ☰ ١. لمس؛ فلج ٢. بی‌شاخ

**کۆچاڵ** / koçał/: ناو. چالایی لە چیادا ☰ چالە در کوە

**کۆچان** / koçan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //کۆچات؛ دەکۆچێی؛ بکۆچێ// کۆچ کردن؛ کۆچین: ١. بار کردن؛ کۆچ لێنان؛ وەنایش؛ چووڵ کردن؛ نەمەنن؛ وە جێ هێشتن؛ ڕەو کردن؛ بارگە تێکەوە پێچان ٢. گواستنەوە؛ گۆزانەوە ☰ ١. کوچیدن ٢. نقل مکان کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: کۆچاو/ چاوگی نەرێنی: نەکۆچان

**کۆچاو** / koçaw/: ئاوەڵناو. کۆچ‌کردوو ☰ کوچ‌کردە

**کۆچاوکۆچ** / koçawkoç/: ناو. کۆچای کۆچ؛ کۆچەڵکۆچ؛ باری ڕەوەندێ کە چەند جار جێ زۆزان دەگۆڕێ ☰ وضعیت چادرنشینی کە از ییلاقی بە ییلاق دیگر می‌رود

**کۆچای کۆچ** / koçay koç/: ☜ کۆچاوکۆچ

**کۆچبار** / koçbar/: ناو. ١. ☜ کۆچەر[١] ٢. کار و ڕەوتی کۆچ کردن ‹دەمی کۆچبارەکەت ناچێ لە یادم/ دەبێ وەک کوشتمت بشپرسی یادم «هەژار، چوارینەکان»› ☰ ١. ☜ کۆچەر[١] ٢. کوچ

**کۆچبەر** / koçber/: ☜ کۆچەر[١]

**کۆچراو** / koçraw/: ئاوەڵناو. بارپێ‌کراو لە ئاوایی ☰ کوچاندە شدە

**کۆچرەو** / koçřew/: ☜ کۆچەر[١]

**کۆچک** / koçik/: ناو. ١. ☜ کۆچکە‌ـ١ ٢. سەگ ٣. کۆشک؛ قەسر و سەرسەرا ٤. کەفچی؛ کوچکانی؛ قەڵماسک ٥. ☜ کەوچك ☰ ١. ☜ کۆچکەـ١ ٢. سگ ٣. قصر ۴. فلاخن ۵. ☜ کەوچك

**کۆچکردوو** / koçkirdû/: ئاوەڵناو. /کینایە/ کۆچی دوایی کردوو؛ مردوو ☰ متوفا

**کۆچکرەش** / koçikřeş/: ئاوەڵناو. /کینایە/ شووم؛ بێفەڕ؛ جووتقۆشە؛ جووتمۆر ☰ نحس؛ شوم

**کۆچکرێژە** / koçikřêje/: ناو. بەردەشووشە ☰ سنگ شیشە

**کۆچکە** / koçke/: ناو. ١. کۆچک؛ کۆچەکە؛ قۆرچکە؛ جۆرێ سەرپۆشی زارۆک و ژنان ‹لە ناو دیدا کە دەچمە بەربەرۆچکە/ دەدەن دەورم منالی سەر بە کۆچکە «هێمن»› ٢. لەنتەری ناو سەرپۆش بۆ ڕاوی پاساری بە شەوارە ٣. سێ‌پاڵ؛ هیرەم ٤. ☜ کەوچك ☰ ١. نوعی سرپوش کودکان و زنان ٢. چراغ حُبابدار ویژەی شکار شبانەی پرندە ٣. هِرَم ۴. ☜ کەوچك

**کۆچلەبەر** / koçleber/: ☜ کۆچەر[٢]ـ١

**کۆچڵە** / koçłe/: ناو. شوێنی ئاو بەش کردن بۆ برنجەجاڕ ☰ جای تقسیم آب شالیزار

**کۆچڵەبەست** / koçłebest/: ناو. کاری دابەش کردنی ئاو بۆ سەر چەڵتووکجاڕ ☰ تقسیم آب در شالیزار

**کۆچمێش** / koçmêş/: ناو. ١. خەڵێف؛ پلوورە ٢.

شڵخە؛ پوورە؛ بەرەی تازەی مێشەنگوین 🇮🇷 ١. کندوی عسل ٢. نسل تازەی زنبور عسل

**کۆچوبار** / koç û bar/: ناو. کۆچ؛ کۆچوماڵ؛ بارەبار 🇮🇷 اسباب و اثاثیەی کوچ کردن

**کۆچوکۆچبار** / koç û koçbar/: ناو. کار و ڕەوتی کۆچ کردن ‹کاتی کۆچوکۆچبار نییە، بارگە و بنەت بۆ تێک دەنێی؟› 🇮🇷 عمل و فرایند کوچ کردن

**کۆچوماڵ** / koç û mał/: ☜ **کۆچوبار**

**کۆچە** / koçe/: ناو. ١. جۆرێ هەنجیر ٢. قوژبن؛ سووچ ٣. زۆران؛ زۆرەوانی 🇮🇷 ١. نوعی انجیر ٢. گوشە؛ زاویە ٣. کُشتی

**کۆچەر**[١] / koçer/: ناو. کۆچبار؛ کۆچبەر؛ کۆچڕەو؛ ڕەوەند؛ خێلات؛ گەڕۆک؛ کرووە؛ خێڵەکی؛ کەسێ کە لە شوێنێ دەچێ و لە شوێنێکی تر نیشتەجێ دەبێ ‹... جارێک چوار شەو ڕۆیشتم، کۆچەری قەشقایی تێیانگەیاندم کە ڕێگەم هەڵە کردووە، گەڕامەوە!... «هەژار، چێشتی مجێور»› 🇮🇷 کوچ‌نشین

**کۆچەر**[٢]: ناوەڵناو. ١. کۆچبەر؛ کۆچلەبەر؛ گەڕۆک؛ ڕەوەند؛ بە خۆ و هۆگرەتی کوچ کردن ٢. دەربەدەر؛ مشەخت؛ ڕەبەن؛ بێ خانەولانە و جێگەی نیشتەجێ بوون 🇮🇷 ١. کوچندە ٢. آوارە

**کۆچەراتی** / koçeratî/: ☜ **کۆچەری**[١]-١

**کۆچەران** / koçeran/: ناو. ئاگرخۆشکەری ناو گۆڕک 🇮🇷 آتشبان

**کۆچەری**[١] / koçerî/: ناو. ١. کۆچەراتی؛ خێلاتی؛ چەشنێ لە ژیانی کۆمەڵایەتی کە کەسانی کۆمەڵگا بۆ دابین کردنی پێداویستییەکانیان، جار لە دووی جار لە جێگایێکەوە بۆ جێگایەکی تر کۆچ دەکەن ٢. جۆرێک هەڵپەڕکێی کوردی 🇮🇷 ١. کوچ‌نشینی ٢. نوعی رقص و پایکوبی کُردی

**کۆچەری**[٢]: ناوەڵناو. ١. خێلاتی؛ عەشایەری ‹ژیانی کۆچەری› ٢. پێوەندیدار یان سەر بە کۆچەر ‹ئای لە حەلاو خان خانمەی کۆچەری/ هەر خۆی دەگەڕێ لە شوێن موشتەری «فولکلۆر»› 🇮🇷 ١. عشایری ٢. مرتبط با کوچ‌نشینی

**کۆچەک** / koçek/: ناو. ١. پلەیەک لە پیاوی ئایینی ئێزدی ٢. شەکەرۆکە؛ منداڵی لووسکە کە لە بەزمدا سەما دەکا ٣. ئالاش؛ هەلاش؛ هەژگ؛ گەلا و چڵووی سەر دارەڕا ٤. بەچکە وشتر 🇮🇷 ١. از القاب روحانیان ایزدی ٢. بچه‌ای که در مجلس بزم می‌رقصد ٣. انبیره ٤. بچەی شتر

**کۆچەکاو** / koçekaw/: ناو. جۆرێ هەنجیر 🇮🇷 نوعی انجیر

**کۆچەکە** / koçeke/: ☜ **کۆچکە** -١

**کۆچەکی** / koçekî/: ناو. ١. سێجرتی؛ هەڵپەڕکێی زۆر خێرا و توند ٢. گۆرانی بۆ هەڵپەڕکێی زۆر توند 🇮🇷 ١. رقص بسیار پُرجنبش ٢. ترانەی رقص پرجنبش

**کۆچەگر** / koçegir/: ناو. زۆرانباز؛ زۆرەبانباز؛ زۆرانگر؛ زۆرانیگر؛ زۆرەوانیگر؛ ملانێکەر؛ گەمشۆ 🇮🇷 کشتی‌گیر

**کۆچەڵکۆچ** / koçełkoç/: ☜ **کۆچاوکۆچ**

**کۆچەڵە** / koçełe/: ناو. ١. بیر؛ چاڵاو ٢. کۆچیلە؛ جامۆڵەی لە چێو ٣. کۆچڵە؛ جێ دابەش بوونەوەی ئاوی برنجاڕ 🇮🇷 ١. چاه آب ٢. کاسەی کوچک چوبین ٣. جای تقسیم آب شالیزار

**کۆچی** / koçî/: ناوەڵناو. بە پێی کۆچی پێغەمبەری ئیسلام لە مەککەوە بۆ مەدینە 🇮🇷 هجری

▣ **کۆچی مانگی**: ساڵپێوی کۆچی، بە پێی ڕۆژئەژمێری مانگی 🇮🇷 هجری قمری

**کۆچی هەتاوی**: ساڵپێوی کۆچی، بە پێی ڕۆژئەژمێری هەتاوی 🇮🇷 هجری شمسی

**کۆچیل**[١] / koçîl/: ناو. کۆچوبار 🇮🇷 کوچ

▣ **کۆچیل کەسێ شەڕ بوون**: *[نزا]* مبارەک نەبوونی کۆچوباری کەسێ 🇮🇷 نامیمون بودن کوچ کسی

**کۆچیل**[٢]: ناوەڵناو. نوقسان؛ نەقوستان؛ سەقەت 🇮🇷

فلج

**کۆچین / koçîn/:** ☜ **کۆچان**

**کۆچێڵ / koçêł/:** ناو. دارێ کە لە ترسی با لە سەر ڕەشماڵ دادەنرێ ⇐ چوبی کە برای مقابلە با باد شدید روی سیاەچادر می‌گذارند

**کۆخ / kox/:** ناو. ١. خـوخ؛ هەشتالـوو ٢. ☜ کەوێڵ-١ ⇐ ١. هلو ٢. ☜ **کەوێڵ-١**

**کۆخا / koxa/:** ☜ **کەیخودا**

**کۆخاندن / koxandin/:** چاوگ. کۆخین؛ کووکین؛ کووخیاندن؛ قۆزین ⇐ سُرفە کردن

**کۆختە / koxte/:** ☜ **کەوێڵ-١**

**کۆخڕ / koxiř/:** ☜ **کۆبڕ**

**کۆخک / koxik/:** ناو. ١. ☜ **کۆخە -١** ٢. ☜ **کەوێڵ-١** ٣. جۆرێ سەرپێچی ئاورێشمی ژنانە ⇐ ١. ☜ **کۆخە-١** ٢. ☜ **کەوێڵ-١** ٣. نوعی سرپوش ابریشمی زنانە

**کۆخکاڕەش / koxkařeş/:** ☜ **کۆخەڕەشە**

**کۆخکی / koxkî/:** ☜ **کۆخن**

**کۆخن / koxin/:** ئاوەڵناو. کـۆخکی؛ کولهـایۆخ؛ تایبەتمەندی نەخۆشێ کە زۆر ئـەقفێ ⇐ ویژگی بیماری کە بسیار سُرفە می‌کند

**کۆخە / koxe/:** ناو. ١. کـوخ؛ کوخـک؛ کۆخـک؛ کۆکە؛ کولە؛ قـف؛ قفـە ٢. ☜ **کـەیخـودا** ⇐ ١. سُرفە ٢. ☜ **کەیخودا**

**کۆخەڕەشە / koxeřeşe/:** نـاو. کۆخکـاڕەش؛ کۆکەڕەشە؛ قۆزەڕەشە ⇐ سیاەسُرفە

**کۆخین / koxîn/:** ☜ **کۆکین**

**کۆد[1] / kod/:** ناو. ١. کاسەی دارینی شیر دۆشـین ٢. قفڵ؛ قوڵف ٣. پووشانە؛ سەرانە لە ئـاژەڵ کـە زۆردار لـە ڕەنجبـەری ئەسـێنێ ٤. کۆمەڵـێک نیشانە بۆ دەربڕینی واتـای نهـێنی ⇐ ١. کاسـەی چوبین کە شیر در آن دوشند ٢. قُفل ٣. حق‌المرتـع ٤. کُد

▣ **کۆدی ئابووری:** ژمارەی پێناسی دەسهاتی کەس یـان مەزرێنگەیـەک لـە لایـەن وەزارەتی داراییەوە ⇐ کُد اقتصادی

**کۆدی پۆستی:** ژمارەی پێناسـەی جـێوشـوێنێ پۆستی ⇐ کُد پستی

**کۆد[2]:** ئاوەڵناو. کۆم: ١. پشتچەماو ٢. کـووڕ ⇐ ١. کوژپشت ٢. مُقعر

**کۆداگر / kodagir/:** ئاوەڵناو. کۆگرەوە؛ هەمیانی ⇐ جامع

**کۆداندن / kodandin/:** چاوگ. ١. پێکـهێنـان ٢. دنە دان ⇐ ١. فراهم کردن ٢. تحریک کردن

**کۆدقەلین / kodqelîn/:** ئاوەڵناو. بـەدودم؛ شـووم؛ پێوقەدەمشەڕ ⇐ شوم

**کۆدک / kodik/:** ناو. ١. کوتک؛ کاسـەی گـەورەی دارین ٢. قفلی چکۆلە ⇐ ١. کاسەی بزرگ چوبین ٢. قُفل کوچک

**کۆدۆ / kodo/:** ئاوەڵناو. چاونـەزێر؛ چـاوچنۆک؛ تەماحکار ⇐ طمعکار

**کۆدۆش / kodoş/:** ناو. *[ناشیرین]* دەویت؛ قوڕمساخ؛ جاکێش ⇐ جاکش

**کۆدە / kode/:** نـاو. ١. زەویـنی زۆر سـەخت و جووت لێنەکراو ٢. پووش و پاری پاوان ٣. کـۆد؛ پووشانە ٤. گیای چیـا و قانگەلاشـک کـە کـۆی دەکەنەوە و لە گیشەی دەدەن ٥. تـاپۆ؛ قەواڵـە؛ سەنەد ٦. ☜ **کۆدەڵە** ⇐ ١. زمـین بـایر سخت ٢. چراگاە اختصاصی ٣. حق‌المرتع ٤. گیاە کوە و کوهپایە کە جمع‌آوری می‌کنند ٥. سند ٦ ☜ **کۆدەڵە**

**کۆدەڵە / kodełe/:** ناو. کـۆدە؛ بەچکـە بـەراز ⇐ بچەخوک

**کۆدێن / kodên/:** ☜ **کۆماڵ**

**کۆر / kor/:** ☜ **کوێر**

▣ **کۆرەوە بوون:** ☜ **کوێرەوە بوون**

**کۆراخ / korax/:** ناو. مۆزەڕەشە؛ مێروویەکی ڕەشە

له زەرگەتە زلتر ☰ حشرەای سیاه رنگ از زنبور بزرگتر

**کۆراڤ / korav/**: ناو. ١. هەرگاو؛ ئاوی قوڕاوی ٢. ☜ کویراو ☰ ١. آب گل‌آلود ٢. ☜ کویراو

**کۆرال / koral/**: ناو. مەرجان؛ مرژان؛ بستام؛ بزگ ☰ مرجان

**کۆران / koran/**: ناو. کۆلان؛ کاپان؛ کووجی ☰ کوچه

**کۆراندنەوە / korand(i)newe/**: چاوگ. دوو یان چەندپاتە کردنەوەی قسە (بەتایبەت بۆ منەت بەسەر کردن) ☰ بازگو کردن

**کۆرانە / korane/**: ☜ کویرانە

**کۆراو / koraw/**: ناو. ١. ☜ کویراو ٢. سەرچاوەیێ کە تەنیا بەهاران ئاوی هەیە ☰ ١. ☜ کویراو ٢. چشمەی فصلی

**کۆرایی / korayî/**: ☜ کویرەیەتی

▣ **کۆرایی داهاتن**: ☜ کویرایی داهاتن

**کۆربەلا / korbela/**: ناو. قاژوو؛ قالاوی تەواو ڕەش و بێخاڵ ☰ کلاغ سیاه

**کۆرپە[1] / korpe/**: ناو. کۆرپەڵە: ١. زارۆی ساوا ٢. پزُ؛ پێزە؛ تۆل ٣. داری پەرتیوراو ☰ ١. نوزاد ٢. جنین ٣. درخت هرس‌شده

**کۆرپە[2]**: ئاوەڵناو. کۆرپەڵە: ١. تایبەتمەندی بەهارێ کە هەواخۆشی بکەوێتە دواوە و گژوگیا دێر سەردەربێنن ٢. ساوا؛ زۆر کەم‌تەمەن ‹بەرخی کۆرپە› ☰ ١. ویژگی بهاری که تاخیر کرده باشد ٢. نوزاد

**کۆرپەساوا / korpesawa/**: ناو. ببڵە؛ ساوا؛ بێچووی تازەزاو ☰ نوزاد

**کۆرپەڵە / korpełe/**: ناو. ١. ☜ کۆرپە ٢. ساوای ساغ و قەڵەو ☰ ١. ☜ کۆرپە ٢. نوزاد دُرُشت و شاداب

**کۆرت / kort/**: ناو. ١. قوولکە؛ چالایی زەوی ٢. جێگە و شوێنی کوانی خورما ٣. چالی چەنە ٤. کەرتی سەوزیکاری ٥. پشتەمل؛ لای ژێرووی پشتەمل ☰ ١. چاله ٢. انبار خرما ٣. چاه زنخدان ۴. کرت؛ بخش سبزیکاری ۵. پس گردن

▣ **کۆرتا زەنێ**: چالی چەنە ☰ چاه زنخدان

**کۆرتاری / kortarî/**: ناو. قوولی تاریک ☰ چالەی تاریک

**کۆرتک / kortik/**: ناو. قوولکە ☰ چاله

▣ **کۆرتکا چاڤ** قوولکەی چاو ☰ کاسەی چشم

**کۆرتکا قەمچکە** قوولکەی پشت مل ☰ پس گردن

**کۆرتکادزا / kortkad(i)za/**: ناو. کەلێن و قوژبنی سەر کە ڕشک و سپێ خۆی تێدا مەڵاس دەکەن ☰ عمق پوست سر که شپش در آن، جا خوش کند

**کۆرتیخ / kortîx/**: ناو. کۆرتیخە؛ جوچکە سمت ☰ لگن؛ استخوان بالای ران

**کۆرتیخە / kortîxe/**: ☜ کۆرتیخ

**کۆرجک / korcik/**: ناو. باس قەننە؛ قەلوون؛ سەبیلەی کلک درێژی لە کانزا ☰ چُپُق دسته بلند

**کۆردل / kordil/**: ☜ کویردڵ

**کۆردڵ / kordił/**: ☜ کویردڵ

**کۆردەرە / kordere/**: ناو. ١. دۆڵ و دەرەی قووڵ و بن‌بەس ٢. جێ کارێزی بێ‌ئاو ☰ ١. درەی تنگ بُن‌بست ٢. قنات خشک‌شده

**کۆرژا / korja/**: ناو. ١. کووژکە مووروێکی شینی کون ـ کونە لە جۆرێ قاپێلکی جانەوەری دەریایی دروست دەکرێ و بۆ چاوەزار بە منالییەوە دەدروون ٢. بیبیلە؛ گلێنەی چاو ☰ ١. خرمُهره ٢. مردُمک چشم

**کۆرک / korik/**: ☜ کۆترەباریکە

**کۆرکۆرە / korkore/**: ☜ کۆلارە ـ١

**کۆرگ / korig/**: ☜ کەوەر ـ١

**کۆرمێخ / kormêx/**: ناو. سنگی درێژ و ئەستوور کە

ڕەشماڵی پێ دەبەستنەوە ☰ ستون بلند و قطور سیاهچادر

**کۆرنان** / koman/: ☜ **کوێرنان**

**کۆروە** / korwe/: ناو. بەردێکی سپییە لە دەم چەمان، ژەنگی کانزای پێ دەماڵن ☰ نوعی سنگ سفید

**کۆرۆخ** / korox/: ناو. ١. زەردەواڵە؛ زەرگەتە ٢. مۆزەکەرانە؛ خەرەنگەزە؛ کەرەنگێزە ☰ ١. زنبور ٢. خرمگس

**کۆروو** / korû/: ☜ **کوێرو**

**کۆرووژمە** / korûjme/: ناو. کرووشمە؛ کاری خۆ کز کردن و مات دانیشتن ☰ عمل کز کردن

▣ **کۆرووژمە کردن**: کرووشمە کردن؛ هەڵتووتەکان ‹هەژار لێی دەبڕێ ئاوردوو و زمهەڕ/ کۆرووژمەی دەکا فەقیر مالانگەڕ «هێمن»› ☰ کز کردن

**کۆرە** / kore/: ناو. ١. ☜ **کوێر**[1] ٢. بەردی شینی ناسک کە بە دەست دەشکێ ٣. گەنمەشامی ٤. ☜ **کوێرو** ☰ ١. ☜ **کوێر**[1] ٢. سنگ نازک و تُرد ٣. ذرت ۴. ☜ **کوێرو**

**کۆرەبزنگلە** / koreb(i)zing(i)le/: ناو. جۆرێ مارە کە دەنگی زەنگۆڵەی لێ دێ ☰ مار زنگی

**کۆرەبەشک** / korebeşk/: ناو. جۆرێ مشکی زل لە بیابان ☰ نوعی موش صحرایی

**کۆرەخانە** / korexane/: ☜ **کوورەخانە**

**کۆرەدار** / koredar/: ناو. تێلەکەپووشکە ☰ پُشتەی هیزم

**کۆرەدەرە** / koredere/: ☜ **کوێرەدەرە**

**کۆرەدێ** / koredê/: ☜ **کوێرەدێ**

**کۆرەڕا** / koreřa/: ☜ **کوێرەڕێ**

**کۆرەڕێ** / koreřê/: ☜ **کوێرەڕێ**

**کۆرەک**[1] / korek/: ناو. کارس؛ گەلدوو؛ هەرزن ☰ ارزن

**کۆرەک**[2]: ناوەڵناو. چاوپرووش؛ نیوەکوتر؛ کەمبین ☰ کم‌سو

**کۆرەکۆر** / korekor/: ☜ **کوێرانە**[2]

**کۆرەگە** / korege/: ناو. ١. کۆرکۆرەی ئاسیاو ٢. دۆلاش ☰ ١. جای توپ پرەی آسیا ٢. ناودانی آسیا

**کۆرەلاش** / korełaş/: ناو. گیایەکە ☰ گیاهی است

**کۆرەمار** / koremar/: ناو. ڕەقەمار؛ کەڕەمار؛ جۆرێ ماری بۆری سەر سێ‌سووچی ژەهرداره ☰ افعی خاکستری

**کۆرەمشک** / koremişk/: ناو. جرج؛ جرجەمشک؛ مشکەکوێرە؛ جۆرێ مشک ☰ موش‌کور

**کۆرەوەری** / korewerî/: ☜ **کوێرەوەری**

**کۆری** / korî/: ناو. ١. ☜ **کوێریەتی** ٢. زنجی مالات تێ‌کردن بە شەودا ☰ ١. ☜ **کوێریەتی** ٢. محوطەی محصور برای دام

**کۆریانەوە** / koryanewe/: چاوگ. ١. چووزانەوە؛ سووزیانەوەی پێست ٢. کوێرەو بوون؛ پڕ بوونەوە (بەتایبەت کونی نەرمەی گوێ) ‹ئەگەر ماوەیەک گوارە لە گوێ نەکەی کونەکەی ئەکۆرێتەوە› ٣. بە منداڵی هەتیو کەوتن ☰ ١. سوزش داشتن پوست ٢. مسدود شدن؛ بە هم آمدن ٣. در کودکی یتیم شدن

**کۆریزان** / korîzan/: ناوەڵناو. گێل؛ کەمعەقڵ؛ فەحە ☰ ابله

**کۆڕ**[1] / kor̄/: ناو. ١. جێگەی کۆ بوونەوە ٢. کۆی چەند کەس لە دەوری یەک ‹تا کەنگێ خەریکی پێنج و چواران مەیگێڕ!/ دلخۆشی بدە بە کۆڕی یاران، مەیگێڕ! «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ٣. چیای بەرز ٤. زنجی ئاژەڵ تێ‌کردن ☰ ١. مجلس؛ جای تجمع ٢. گردهمایی ٣. کوه بلند ۴. محوطەی محصور ویژەی دام

▣ **کۆڕی زانیاری**: چاندگە؛ کۆزمان؛ کۆڕێ لە زانیاران، وێژەوانان یان هونەرمەندانی وڵاتێک، بۆ پەرە پێدانی زانست، وێژە یان هونەری ئەو

ولاتە ☰ فرهنگستان

⊡ **کۆڕ بەستن:** ☜ **کۆڕ گرتن**

**کۆڕ گرتن:** کۆڕ بەستن؛ کۆ بوونەوە؛ بەڕێوە بردنی جڤات بە ڕێورەسمی تایبەتەوە ☰ گردهمایی برگزار کردن

**کۆڕ²:** دەنگەناو. حیلەی ئەسپ ☰ شیهەی اسب

**کۆڕان / kořan/:** چاوگ. تێنەپەڕ. //کۆڕات؛ دەکۆڕێ؛ بکۆڕێ// ١. دەنگی با لە ئەشکەوتەوە هاتن ٢. حیلاندنی ئەسپ ٣. کۆڕین؛ بۆڕاندنی ولاخان ٤. بەسەردا هاتن؛ سەرکۆنە کردن ☰ ١. صدای کوران باد آمدن ٢. شیهه کشیدن اسب ٣. غُرّیدن ستور ۴. سرزنش کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەکۆڕان

**کۆڕاندن / kořandin/:** چاوگ. تێنەپەڕ. //کۆڕاندت؛ دەکۆڕێنی؛ بکۆڕێنە// حیلاندنی ئەسپ ☰ شیهه کشیدن اسب

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەکۆڕاندن

**کۆڕاندنەوە / kořand(i)newe/:** چاوگ. کۆڕاننەوە؛ سەرکۆنە کردن ☰ سرزنش کردن

**کۆڕاننەوە / kořannewe/:** ☜ **کۆڕاندنەوە**

**کۆڕانەوە / kořanewe/:** ☜ **کرەوزانەوە**

**کۆڕبەندی / kořbendî/:** ناو. کۆنفرانس ☰ کنفرانس

**کۆڕژن / kořjin/:** دەنگەناو. حیلەی توورەییانەی ئەسپ ‹لرفەلرفی لوک و نەڕ/ کۆڕژنی ئەسپی بەدفەڕ «هێمن»› ☰ شیهه و غُرش اسب

**کۆڕس / kořis/:** ناو. کری جۆلا ☰ بافتەی جولا

**کۆڕسکەر / kořisker/:** ناو. جۆلا ☰ بافنده؛ جولا

**کۆڕگە / kořge/:** ناو. جێگەی کۆ بوونەوە ☰ مجلس

**کۆڕگێڕ / kořgêř/:** ئاوەڵناو. بەزمگێڕ؛ ئاهەنگگێڕ ☰ بزمآرا

**کۆڕەدار / koředar/:** ناو. جەنگەڵی چوغر ☰ جنگل انبوە

**کۆڕەو / kořew/:** ناو. کۆچی بەکۆمەڵ ☰ کوچ گروهی

**کۆڕیانەوە / kořyanewe/:** ☜ **کۆڕانەوە**

**کۆڕین / kořîn/:** چاوگ. کۆڕان؛ بۆڕاندنی ولاخان ☰ غُرّیدن ستور

**کۆز / koz/:** ناو. ١. کاری بە دەورە دەست گرتن لە هەڵپەرکێدا ٢. کۆزە؛ تامانی جێگەی بەرخ و کار ‹کۆزی ببینە و پارووی لە ماستی بگرە! «مەسەل»› ٣. ئالفجاڕ؛ جێ لەوەڕ ٤. زۆزان؛ یێلاخ ٥. کۆمەڵگا؛ جڤات؛ جوات ‹کێ شیوەن بکا بۆ جێماویی هۆز/ کێ فیداکار بێ بۆ هۆز و بۆ کۆز «قانع»› ٦. حەشارگەی کەو ٧. جەغز؛ دایرە ٨. ☜ **کۆزرە ـ١** ☰ ١. رقص گروهی دایرەوار ٢. نوعی کازه، جای نوزاد بُز و گوسفند ٣. چراگاه ۴. ییلاق ۵. جامعه ۶ کازه؛ کمین کبک شکاری ٧. دایره ٨. ☜ **کۆزرە ـ١**

⊡ **کۆز کردن:** لە دەوری یەک کۆ بوون ☰ دور هم جمع شدن

**کۆزارک / kozarik/:** ناو. گوژاڵک؛ کاڵەکەمارانە ☰ هندوانەی ابوجهل

**کۆزانە / kozane/:** ناو. ١. جۆرێ ترێ ٢. جۆرێ پەزی گەورەی دەموچاو گرۆڤەر ☰ ١. نوعی انگور ٢. نوعی گوسفند

**کۆزر / kozir/:** ☜ **کۆزرە**

**کۆزرە / koz(i)re/:** ناو. کۆزر: ١. کۆز؛ کۆزی؛ پەرەنگ؛ پۆلوو؛ سکڵ ٢. کوێزر؛ کۆزەرە؛ کۆتەڵ؛ چەتی خەرمان ☰ ١. اخگر ٢. نُخالەی کاه خرمن

**کۆزک / kozik/:** ناو. ١. کۆزی بێچووە ساوایان ٢. کولێن؛ کولانەی مامر ٣. خەندەک؛ خەنەق ٤. سیپە؛ ڕەبەت؛ بەرگە ☰ ١. جای نوزادان گله ٢. لانەی مُرغ ٣. خندق ۴. کمین شکارچی

**کۆزلاخ / kozłax/:** ☜ **کەوێڵ ـ١**

**کۆزمان / kozman/:** ☜ **کۆڕی زانیاری**

**کۆزە / koze/:** ناو. کۆز؛ تامانی کار و بەرخ ☰ جای

نوزادان بُز و گوسفند

**کۆزەر**[1] / kozer/: ناو. ١. کۆتەرەدار ٢. کۆزەرە؛ چەت؛ کۆتەڵی خەرمان ‹کۆزەر هەتا زیاتر بیکوتی گەنمی زیاتر دەدات «مەسەل»› ١. تنەی درخت ٢. نُخالەی کاه خرمن

**کۆزەر بەر با گرتن:** ☜ **کۆزەرێك گرتن**

**کۆزەرێک گرتن:** [مەجاز] کۆزەر بەر با گرتن؛ کوتەک لێدان ‹ئەگەر دەسم گەیی پێت، کۆزەرێکت ئەگرم!› کُتک زدن

**کۆزەر**[2]: ئاوەڵناو. ڕووت و بێ گەڵا برگ‌ریخته

**کۆزەرقوت** / kozerqut/: ☜ **کۆزەرکوت**

**کۆزەرکوت**[1] / kozerkut/: ناو. کۆزەرقوت؛ کوتکی دارینی چەت کوتان پُتک چوبین کاه کوبی

**کۆزەرکوت**[2]: ئاوەڵکار. [کینایە] کۆزەرقوت؛ ڕەمەکی؛ بە گۆترە ‹کۆزەرکوت هەڵدەکوتێتە سەر کار!› رَمَکی

**کۆزەرە** / kozere/: ناو. ١. کۆزەڵ؛ کۆزەر؛ کۆزی؛ چەت؛ کۆتەڵی خەرمان ٢. [کینایە] ڕدێنی تۆپ ١. کوزل؛ نُخالەی کاهِ خرمن ٢. ریش توپی

**کۆزەک** / kozek/: ناو. گوێز؛ گردەکان؛ وەزی گردو

**کۆزەڵ** / kozeł/: ناو. کۆزەر؛ کۆزر؛ چەت؛ کۆتەڵ کوزل؛ نُخالەی کاه

**کۆزی** / kozî/: ناو. ١. ☜ **کۆزرە ـ١** ٢. تەپالەی پێک هەڵپەسێراو تا باشتر ئاگر بگرێ ١. ☜ **کۆزرە ـ١** ٢. تاپالەهای به هم تکیه داده شده که بهتر بسوزد

**کۆزیدان** / kozîdan/: ناو. دەوەلان؛ قەلاغدان؛ کۆشک؛ عەماری تەپالە انبار تاپاله

**کۆزیک** / kozîk/: ناو. ١. سەنگەر؛ مەتەرێز ٢. کازە؛ سیپە؛ ڕەبەت؛ بەرگە؛ حەشارگەی ڕاوچی بۆ ڕاوی کەو ١. سنگر ٢. کمینگاه شکارچی برای شکار کبک

**کۆزیلکە** / kozîlke/: ناو. جەغز؛ بازنە؛ شووز ‹کۆزیلکە لە لایێ، ڕەو لە لایێ/ ڕیز دوورودرێژ دوایی نایێ «هەژار، مەم و زین»› حلقه؛ دایره

**کۆزیلکە بەستن:** ئاپۆرە دان؛ دەورە دان؛ کۆ بوونەوە لە دەوری شتێک حلقه زدن

**ـ کۆژ** / koj-/: پاشەوشە. بکرۆژ؛ کرۆژێن ‹پێشەکۆژ› ـ کلوچ

**کۆژاندن** / kojandin/: چاوگ. ١. مێشکی پێشە مژین ٢. کرۆسینەوەی ئێسک ١. مُک زدن به مغز استخوان ٢. به دندان کشیدن استخوان

**کۆژتن** / kojtin/: ☜ **کورۆژتن**

**کۆژتیان** / kojt(i)yan/: ☜ **کورۆژیان**

**کۆژۆ** / kojo/: ئاوەڵناو. ١. چکوس؛ ڕژد؛ ماڵدۆست ٢. ناکەس؛ نامەرد ١. خسیس ٢. نامرد

**کۆژە** / koje/: پێسیر؛ ئێخە؛ بەروو؛ بەرۆک گریبان

**کۆژیل** / kojîl/: ناو. کۆمەڵ؛ ئاپۆرە اجتماع

**کۆژین** / kojîn/: ☜ **کورۆژتن**

**کۆس** / kos/: ناو. ١. بەخت؛ شانس ٢. کۆسپ؛ زەقایی؛ زۆپایی کەمی زەوی ٣. دەفری مەزنی ئاو ٤. تەپڵی گەورە کە زیاتر بۆ شەڕ یان ڕاگەیاندنی هەواڵێک دەیانژەند ١. بخت ٢. برجستگی کم زمین ٣. بشکه؛ ظرف بزرگ آب ۴. کوس

**کۆس کەفتن:** ☜ **کۆست کەوتن**

**کۆسار** / kosar/: ناو. چیای زۆر؛ ناو چیا کوهسار

**کۆساران** / kosaran/: ☜ **کۆسالان**

**کۆساڵ** / kosał/: ناو/ ئاوەڵناو. ساردەسێر؛ کێوسان؛ کوێستان؛ زۆزان سردسیر

**کۆسالان** / kosałan/: ناو. کۆساران؛ کۆسان؛ جێگەی زۆر چیایان کوهساران

**کۆسان** / kosan/: ناو. ١. کۆسالان؛ کۆساران ٢. زۆزان؛ یەیلاخ ٣. جێگەی زۆر بەفرگر ١.

کوهساران ۲. ییلاق ۳. جای بسیار برفگیر

**کۆسپ / kosp/**: ناو. کۆسپایی؛ کۆسپە؛ کۆست: ۱. کۆس؛ زەقایی؛ زۆپایی کەمی زەوی ‹بە تەنیا ئەوە شارەزای کۆسپ و کەندالی ڕێیە «سوارە»› ۲. بەلا؛ بەرگر لە ژیاندا ‹هیوادارم کۆسپی پارە و چەوتی پیتی قەلاییی چاپ، بەردی سارد و گەرمی نەخاتە سەر ڕێگا «سوارە»› ☰ ۱. برآمدگی زمین ۲. مانع؛ گرفتاری

**کۆسپایی / kospayî/**: ☜ **کۆسپ**

**کۆسپە / kospe/**: ☜ **کۆسپ**

**کۆست / kost/**: ناو. ۱. ☜ **کۆسپ** ۲. یاریدە؛ یارمەتی ۳. شانس؛ بەخت و تالە ☰ ۱. ☜ **کۆسپ** ۲. یاری؛ کمک ۳. بخت؛ طالع

◘ **کۆست کەوتن**: کۆس کەفتن: ۱. بەدبەخت بوون ‹ڕەببی هەر کەس دوژمنی ئەو میللەتە دڵ‌پاکەیە/ ژێر کەوێ، کۆستی کەوێ، ڕەببی سەعاتێک نەسرەوێ «هەژار، *ئاڵەکۆک*»› ۲. کەسێکی نزیک مردن ☰ ۱. بدبخت شدن ۲. عزیز از دست دادن

**کۆستان / kostan/**: ☜ **کوێستان**

**کۆستک / kostik/**: ناو. ۱. شەکەتی؛ ماندوویەتی ۲. کووسە؛ بەندی خەنجەر ☰ ۱. خستگی ۲. بند خنجر

**کۆستکەوتو / kostkewtû/**: ئاوەڵناو. کۆست‌کەوتە؛ کۆس‌کەفتگ: ۱. بەدبەخت؛ لێقەوماو ۲. ئازیزمردە ☰ ۱. بدبخت ۲. عزیز مُردە

**کۆستکەوتە / kostkewte/**: ☜ **کۆست‌کەوتو**

**کۆستە / koste/**: ناو. ۱. کۆسە؛ پیاوی بێ‌موو ۲. کۆسە؛ کەسێ کە بە خۆ گۆڕان کایە بۆ خەڵک دەکا ۳. بڵندایی وەک سەکۆ ٤. کەوشەن؛ سنوور ٥. کۆستەک؛ دەڤەر؛ ئاقار ‹خەڵکی کۆستەی ئیلامم› ☰ ۱. کوسە؛ بی‌مو ۲. هنرپیشەی ماسک‌زن ۳. بلندی سکومانند ۴. مرز ۵. دوروبر

**کۆستەبابی / kostebabî/**: ناو. کۆسەبەبە؛ گاڵتەجار؛ حەنەکچی ☰ دلقک

**کۆستەک[1] / kostek/**: ناو. کۆسەک: ۱. بەندی خەنجەر ۲. بەندی کاتژمێر ۳. توورەکەی چەرمین ٤. پێوەندی ئەسپ ٥. سندم؛ پێوەن؛ پێبەندی ئاسنین ٦. دەلالی ژن ڕاست کردن بۆ پیاو ☰ ۱. بند خنجر ۲. بند ساعت ۳. توبرەی چرمی ۴. پایبند اسب ۵. شکال ۶. دلال محبت

**کۆستەک[2]**: ئاوەڵناو. کۆسەک؛ دووڕوو؛ ڕووبین ☰ دورو

**کۆستەکۆست / kostekost/**: ناو. ۱. شات و شووت ۲. بازی و کایەی لە سەر شانۆ کە خۆ دەگۆڕن ☰ ۱. شایعات دروغین ۲. نمایش با ماسک

**کۆستەوەیی / kosteweyî/**: ناو. کایەی شانۆ بە خۆ گۆڕین ☰ نمایش با ماسک

**کۆسکەفتگ / koskeftig/**: ☜ **کۆست‌کەوتو**

**کۆسنیگ / kosnîg/**: ناو. جرجەمشک؛ مشکەکوێرەی دەشت ☰ موش‌کور صحرایی

**کۆسە[1] / kose/**: ناو. ۱. ☜ **کۆستە۱و۲** ۲. کوولەکەی دۆڵمە ۳. کۆستەک؛ بەندی خەنجەر ٤. سەماسی؛ جۆرێ ماسی ڕاوکەر ٥. گەنمی پاک‌کراوی بێ‌چقڵ و داسۆ ٦. هێز؛ توان ☰ ۱. ☜ **کۆستە۱و۲** ۲. کدوی دُلمە ۳. بند خنجر ۴. کوسەماهی ۵. گندم پاک شدە ۶. توان؛ نیرو

**کۆسە[2]**: ئاوەڵناو. ۱. بێ‌موو؛ کەم‌تووک ۲. پاک‌کراو؛ بێ‌چقڵ و داسۆ (گەنم و دانەوێڵە) ☰ ۱. کوسە؛ بی‌مو ۲. پاک‌شدە (گندم و غلات)

**کۆسەبازی / kosebazî/**: ناو. کایەی خۆ گۆڕین ‹زستانان بە شەو، جۆرابێن و کاڵەمستێن و فەلەی بێدەنگ و کۆسەبازی و تەرکی بن بەڕەیان لە مزگەوت دەکرد «هێمن»› ☰ نمایش با ماسک

**کۆسەبەبە / kosebebe/**: ☜ **کۆستەبابی**

**کۆسەبەدار / kosebedar/**: ناو. جۆرێک گەمەی

لاوانی گوندنشین 🇮🇷 از بازی‌ها

**کۆسەچی** / koseçî/: ئاوەڵناو. ١. شیروەشێن ٢. *[مەجاز]* ئازا لە شەڕدا 🇮🇷 ١. شمشیرباز ٢. سلحشور

**کۆسەر** / koser/: ناو. ئەندەروون؛ ژووری ماڵەوە 🇮🇷 اندرونی

**کۆسەک** / kosek/: ☜ **کۆستەك**

**کۆسەکار**[١] / kosekar/: ناو. بووجاڕ؛ بەوەجاڕ؛ تەتەڵەکار؛ کەسێ کە کاری پاک کردنی گەنم و دانەوێڵەیە 🇮🇷 بوجار

**کۆسەکار**[٢]: ئاوەڵناو. ڕیش تەنک 🇮🇷 دارای ریش کم‌پشت

**کۆسەکاری** / kosekarî/: ناو. ١. بووجاڕی؛ بەوەجاڕی؛ تەتەڵەکاری؛ کاری پاک کردنی گەنم و دانەوێڵەیە ٢. کایەی کەسانی خۆگۆڕ 🇮🇷 ١. بوجاری ٢. نمایش با ماسک

**کۆسەمسری** / kosemisrî/: ناو. کۆسەمیسری: ١. جۆرێ هەڵوایە ٢. جۆرێک شمشێری قەدیمی، دروستکراوی میسر 🇮🇷 ١. نوعی حلوا ٢. نوعی شمشیر مصری

**کۆسەمیسری** / kosemîsrî/: ☜ **کۆسەمسری**

**کۆش**[١] / koş/: ناو. ١. کۆشە؛ تەقالا؛ حەوڵ ٢. کەش؛ سەر هەردووک ڕان ‹لەو گەردەن و عیقدە کە پڕە گەردەن و گۆشت/ بەو پێیە کەنارم کە پڕە دامەن و کۆشم «نالی»› ٣. داوێن ‹لە تاریکی خەم و دەردا سروشکم ڕێ بە کۆش نابا/ بە واژوونە بە سەر شانا فوارەی ئەشکباریمە! «قانع»› ٤. *[کینایە]* ژمارەیەکی زۆر ‹کۆشێک منالی هەیە› ٥. *[کینایە]* شەرمی مێوینە 🇮🇷 ١. کوشش ٢. بر؛ روی هر دو ران ٣. دامن ۴. تعداد زیاد ۵. عضو تناسلی زن

**▪ کۆش**[٢]: پاشەوشە. کۆشەر ‹سەختکۆش؛ لاکۆش› 🇮🇷 ـ کوش

**کۆش**[٣]: پێرۆ. ← **کردوکۆش**

**کۆشان** / koşan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //کۆشات؛ دەکۆشی؛ بکۆشە// کۆشین؛ تەقالا دان 🇮🇷 کوشیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: کۆشاو/ چاوگی نەرێنی: نەکۆشان

**کۆشای** / koşay/: چاوگ. کۆشین 🇮🇷 کوشیدن

**کۆشش** / koşiş/: ناو. کۆشە؛ کۆشەش؛ کۆششت؛ کۆشەوە؛ تەقالا 🇮🇷 کوشش

**کۆششت** / koşişt/: ☜ **کۆشش**

**کۆشک** / koşk/: ناو. ١. قەسر؛ قەسرە؛ کاخ؛ کاخە؛ بینایەکی گەورە بە ژووری زۆر و ڕواڵەتی جوانەوە ٢. شەربەی سواڵەت ٣. *[مەجاز]* کۆشکەلان؛ عەمباری تەپاڵە 🇮🇷 ١. کاخ ٢. لیوان سُفالین ٣. تاپالەدان

**کۆشکار** / koşkar/: ناو. پینەچی؛ مشەقە؛ شەکیلی 🇮🇷 پینەدوز

**کۆشکە** / koşke/: ناو. ١. قەلاخ؛ تەپاڵە؛ دەوە ٢. جۆرێ هەرمێ ٣. کرووشمە؛ کوریشکە 🇮🇷 ١. تاپالە ٢. نوعی گلابی ٣. کزکردگی

▣ **کۆشکەلاتن**: کرووشمە کردن 🇮🇷 کز کردن

**کۆشکەلاتو** / koşkełatû/: ☜ **کزکردوو**

**کۆشکەلان** / koşkełan/: ناو. کۆشەلان: ١. قەلاخدان؛ تەپاڵدان ٢. سەرانگۆلک؛ ڕیخەلان؛ سنێرگە؛ جێگای ڕژاندن و کۆکردنەوەی سەنێر 🇮🇷 ١. تاپالەدان ٢. شولە

**کۆشە** / koşe/: ناو. ١. ☜ **کۆشش** ٢. تەپاڵە ٣. گۆشە؛ سووچ؛ قوژبن 🇮🇷 ١. ☜ **کۆشش ٢. تاپالە** ٣. گوشە؛ زاویە

**کۆشەش** / koşeş/: ☜ **کۆشش**

**کۆشەلان** / koşłan/: ☜ **کۆشکەلان**

**کۆشەوە** / koşewe/: ☜ **کۆشش**

**کۆشیار** / koşyar/: ئاوەڵناو. ١. بەکار؛ کارامە؛ بەدەست؛ بەتوانا لە ئەنجام دانی کاردا ٢. تێکۆشەر؛ تەقالاکەر؛ هەولدەر 🇮🇷 ١. کارا ٢. ساعی

**کۆشین** / koşîn/: چاوگ. تێنەپەڕ. //کۆشیت؛

دەکۆشی؛ بکۆشە// هەوڵ دان ▭ کوشیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: کۆشیو/ چاوگی نەرێنی: نەکۆشین

**کۆفرۆش / kof(i)roş/**: ناو. کۆمفرۆش؛ بازرگانی بەرانبەری وردەفرۆش. هەروەها: **کۆفرۆشی** ▭ عُمدەفروش

**کۆفی / kofî/**: ناو. ١. جۆرێ سەرپۆشی ژنانە ٢. کلاوزێڕ؛ تاسکلاوی ژنان ▭ ١. نوعی سرپوش زنانه ٢. نوعی کلاه زنانه

▣ **کۆفیکێل**: کلاولار؛ شەدەلار ▭ کج‌کُلاه

**کۆڤ / kov/**: ئاوەڵناو. کۆم؛ قەمبوور؛ کووڕ ▭ کوژپشت

**کۆڤار / kovar/**: ناو. بەلاڤۆکی حەوتوانە یان مانگانە ▭ مجلّه

**کۆڤان / kovan/**: ناو. ١. خەم؛ خەفەت؛ عەزرەت ٢. کوان؛ دومەڵ ٣. گلێنەی چاو ▭ ١. اندوه ٢. دُمل ٣. مردُمک چشم

**کۆڤرک / kovirk/**: ناو. جۆرە کارگێکە لە ناو چیمەن دەڕوێ ▭ نوعی قارچ

**کۆڤک[1] / kovik/**: ناو. ١. کوفک؛ ڕەحەتی؛ ماستێرک ٢. ئەنگوستیلەی درووман ٣. *[شوورەیی]* کونی قوونگ ▭ ١. قیف ٢. انگشتانه ٣. پیزی؛ سوراخ مقعد

**کۆڤک[2]**: ئاوەڵناو. ١. کەلەقەندی؛ قووتەکی؛ وەک ڕەحەتی ٢. ڕووگرژ؛ مۆن؛ مۆچ؛ ناوچاوتاڵ؛ چڕ و چاو بە کەند و کلۆ ▭ ١. مخروطی ٢. تُرشرو

**کۆڤل[1] / kovil/**: ناو. کۆتەرەدار ▭ کُندەی درخت

**کۆڤل[2]**: ئاوەڵناو. کۆم؛ پشتچەماو ▭ کوژپشت

**کۆڤۆ / kovo/**: ☜ **کۆترەباریکە**

**کۆڤۆکرک / kovokirk/**: ☜ **کۆترەباریکە**

**کۆڤی / kovî/**: ئاوەڵناو. کێوی؛ پێچەوانەی ماڵی ▭ کوهی

**کۆڤێتی / kovêtî/**: ناو. *[کینایە]* هۆڤێتی؛ دڕندەیی؛ کردەوەی پێچەوانەی نەریتی ژیار ▭ توحُش

**کۆقژک / koq(i)jik/**: ناو. قاژوو؛ قالاوی تەواو ڕەش و بێخاڵ ▭ کلاغ سیاه

**کۆک[1] / kok/**: ناو. ١. باقیە؛ تەقەڵی درشت ٢. دەرکەوان؛ درگاوان ٣. قورمیشی کاتژمێر ٤. بنەڕەت؛ بنەما؛ ڕەگ و ڕیشە ‹ئەو ژ کۆکا خوە ڤا کوردن› ٥. بیانوو؛ بەهانە؛ پەڵپ ٦. ڕەگەز؛ بنیچە؛ ڕەچەڵەک؛ ڕەسەن ٧. ڕەمڵ؛ لم ▭ ١. بخیه؛ کوک خیاطی ٢. دربان ٣. کوک ساعت ۴. ریشه و شالوده ۵. بهانه ۶. نژاد ۷. شن

▣ **کۆک کردن**: ١. کاک گرتن؛ تەقەڵی درشت لێ دان ٢. قورمیش کردنی کاتژمێر ▭ ١. بخیەی درشت زدن ٢. کوک کردن ساعت

**کۆک گرتن**: ١. کۆک کردن؛ بە تەقەڵی درشت دروونەوە ٢. پەڵپ بەستن ▭ ١. بخیەی درشت زدن ٢. بهانه‌گیری کردن

**کۆک[2]**: ئاوەڵناو. ١. تەڕپۆش؛ جلک‌تازە ‹بە منداڵی زۆر تێر و تەسەل و کۆک و پۆشتە بووم «هێمن»› ٢. قەڵەو؛ چاخ ٣. ساز و دڵخۆش ٤. نێوانخۆش ‹پێکەوە کۆکن› ٥. ڕازاوە؛ خۆ جوان کردوو ٦. ڕێک‌کەوتوو ▭ ١. خوش‌پوش ٢. چاق ٣. سرحال ۴. صمیمی ۵. شیک ۶. موافق

▣ **کۆک بوون**: ١. ڕێک کەوتن ‹ئیسلامییەکان تەنیا لە شتێکدا کۆکن: کە لە هیچ شتێکدا کۆک نەبن!› ٢. نێوان خۆش بوون ‹حیزبەکانمان قەت لەگەڵ یەک کۆک نەبوون!› ٣. ڕازاوە بوون ٤. بەکەیف بوون؛ دڵخۆش بوون ▭ ١. بە توافق رسیدن ٢. صمیمی بودن ٣. آراستە بودن ۴. سر حال بودن

**ـ کۆک[3]**: پاشگر. ـ ک؛ ـ کۆ؛ بۆ پچووک پیشاندان ‹کچکۆک› ▭ ـک

**کۆکک / kokik/**: ئاوەڵناو. ڕەملی؛ لماوی ▭ شنزار

**کۆکله / kokle/**: ناو. لێک‌پێچراوی دەزوو؛ جۆرێ

کلاف 🇮🇷 نوعی کلاف

**کۆکلاش** / kok(i)łaş/: ناو. کۆکلاشک؛ گیایەکە 🇮🇷 گیاهی است

**کۆکلاشک** / kok(i)łaşk/: ☜ **کۆکلاش**

**کـۆکم** / kokim/: ئاوەڵـناو. ۱. گێــل و حــۆل ۲. بێئەنوا و دەربەدەر 🇮🇷 ۱. هالو ۲. بیخانمان

**کۆکمە** / kokme/: ئاوەڵناو. پیر و زورهانی لە کـار و کەلک‌کەوتوو 🇮🇷 پیر و ازکارافتاده

**کۆکمەنی** / kokmenî/: نـاو. پـیری و زورهـانی 🇮🇷 پیری و کُهنسالی

**کۆکنایش** / koknayîş/: چـاوگ. چـرینی خۆشـی مەلان 🇮🇷 آواز خواندن دلنشین پرندگان

**کۆکندار** / kokindar/: نـاو. مەلێکە لـە کـەو ئـەکا، بەلام زلترە و ڕەنگی زەردە 🇮🇷 پرندەای شبیە کبک

**کۆکوپۆشتە** / kok û poşte/: ئاوەڵـناو. تـەڕپۆش و دڵـخۆش ‹کـۆک‌وپۆشـتە بم، ڕووت و ڕەجـاڵ بم/ کۆشـکم دە قـات بـێ، ویرانـەماڵ بم «هــەژار، بـۆ *کوردستان*»› 🇮🇷 خوش‌پوش

**کۆ ـ کۆ** / ko ko/: ئاوەڵکار. دەستە ـ دەستە؛ چین بە چین؛ گەل ـ گەل ‹وێش مەوزۆ نـە کـۆڵ گـۆل وێنەی سەدەف/ کۆ ـ کۆ مرواری پێش مەنیۆ وە کەف «بێسارانی»› 🇮🇷 دستە ـ دستە

**کۆکۆس** / kokos/: نـاو. نەرگیلە؛ نێرگەلە؛ قلیانـاوی 🇮🇷 قلیان

**کۆکە** / koke/: ☜ **کۆخە ـ۱**

**کۆکەڕەشە** / kokeřeşe/: ☜ **کۆخەڕەشە**

**کۆکـــەل**[1] / kokel/: نـــاو. ۱. پەپووســــــێمانە؛ پەپووسلـێمانە ۲. کەڵـەکێوی؛ جـۆرێ حەیوانـە کێـوی ۳. گـردی قـوچ؛ تەپـەی بڵـندی وەک کەلەقەند 🇮🇷 ۱. هُدهُد ۲. کـل کـوهی ۳. تپـەماننـد کلەقندی

**کۆکەل**[2]: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ئازا؛ بوێر؛ وێرا؛ نـەترس 🇮🇷 شُجاع

**کۆکەن** / koken/: نـاو. کۆکەنـد: ۱. کـاری ئالیـک برین بۆ یەکسم ۲. چیاکەن ۳. کـاری دووریـنی گیا لە کێوان ٤. *[کینایە]* کاری زۆر دژوار ‹کۆکەنت کردووە دەڵەی شەکەتم؟› 🇮🇷 ۱. عمل علیق برداشتن برای ستور ۲. کوەکـن ۳. عمـل چیـدن گیـاە ۴. کـار بسیار سخت

**کۆکـــەنار** / kokenar/: نـــاو. ئاڵــــــفەگیایەکی گــوڵبنەوشــی میوەچکۆلــەی وەک هێلکــەی کون‌ـکون و دەنک ڕەشە 🇮🇷 کوکنار

**کۆکەند** / kokend/: ☜ **کۆکەن**

**کـۆکی**[1] / kokî/: نـاو. ۱. پۆشـتەیی؛ تەڕپۆشـی ۲. دەمــاخ‌چــاخی؛ سەرحاڵــی ۳. نێـوان‌خۆشــی؛ بەین‌خوەشی ٤. مەلێکی پچووکـە لـە دەسـتەی چوێلــەکان 🇮🇷 ۱. خــوش‌پوشــی ۲. تردمــاغی ۳. صمیمیت ۴. پرندەای از تیرەی گنجشکان

**کۆکی**[2]: ئاوەڵناو. بنەڕەتی؛ عەسڵی 🇮🇷 اصلی

**کـۆکین** / kokîn/: چاوگ. تێنەپەڕ. //کۆکیت؛ دەکۆکی؛ بکۆکە// کلهاییش؛ کوخـاین؛ کـوخین؛ کـۆخین؛ قفین؛ قۆزین 🇮🇷 سُرفە کردن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: کۆکیـو/ چـاوگی نـەرێنی: نەکۆکین

**کۆگـا** / koga/: ناو. ۱. کۆ؛ کۆما؛ کـۆم؛ ئـەوەی بـە سەر یەکـدا کەڵـەکە کـراوە ‹کۆگـای هێـزم› ۲. شوێنی کـۆ بوونـەوە ‹کۆگـای ئـازادی› ۳. کانگـا ‹شەرارەی گرپەی نار مەهجووری/ کەردەن وە غوبار کۆگــای ســەبووری «مەولــەوی»› ٤. دووکــانی وردەواڵـەفرۆشـی 🇮🇷 ۱. تـودە ۲. محـل تجمُـع ۳. جایگاە ۴. مُغازەی خرازی

⊡ **کۆگـا دان:** بە سەر یەکا دانان 🇮🇷 بر هم انباشـتن؛ تلنبار کردن

**کۆگابازی** / kogabazî/: ناو. بـازی خـۆڵ بـە سـەر یەکا کردن؛ کۆخاک دروست کردن 🇮🇷 خاکبازی

**کۆگــاکراو** / kogak(i)raw/: ئاوەڵـناو. گومەڵـــتە؛

کۆمابووگ ☰ انباشته شده

**کۆگرد** / kogird/: ئاوەلکار. گشت؛ تێکڕا؛ تێکڕایی ☰ روی هم؛ همگی

**کۆگرەوە** / kog(i)rewe/: ☜ **کۆداگر**

**کۆگە** / koge/: ناو. عەمار؛ عەنبار ☰ انبار

**کۆگەوان** / kogewan/: ناو. عاماردار ☰ انباردار

**کۆڵ**[1] / kol/: ناو. ١. ئاوخۆرەی ئاژەڵ لە دار یان لە بەرد و قوڕ ٢. قەمتەرە؛ قەم؛ قەینتر؛ ئاوبارە ٣. تەشتی داریــنی زۆر زلی نانــەوا بــۆ هەویر ٤. پلووسکی گەنم لە ئاسیاوا ٥. خەڵێفەمێش کە هەمووی کلۆرایی دار بێ و بڕابێ ٦. پێوانەی دەخڵ لە دار کە شازدە کیلۆ دەبا ٧. کۆڵە؛ تێلەکە ٨. بریقەی شاڵ و بووزوو ٩. هەپە؛ خێشک؛ تەختەی ڕێک و لووس کردنی شێوەرد ١٠. چین؛ توێ ☰ ١. آبشخور دام از چوب یا سنگ ٢. پُل ناودانی ٣. ناوەی خمیر ۴. گلوی آسیا ۵. کندەی درخت که لانەی زنبور عسل شده باشد ۶ پیمانەی چوبی غله به ظرفیت شانزده کیلو ٧. کولەپشتی ٨ براقی بافتەی پشمی ٩. هبد؛ مالەی صاف کردن شُخم ١٠. تا؛ شکن

**کۆڵ**[2]: ئاوەڵناو. ڕووت؛ پەتی (بۆ سەر دەگوترێ) ☰ برهنه (سر)

**. کۆڵ**[3]: ☜ **ـ کوڵ**[4]

**کۆلا** / kola/: ناو. ژنی بە پارە کڕدراو ☰ کنیز زرخرید

**کۆلار** / kolar/: ☜ **کڵاو**

**کۆلارە** / kolare/: ناو. کوللارە؛ کۆللارە: ١. کۆرکۆرە؛ کوورکوورە؛ خێزانە باڵندەیەکن لە تۆرەمەی هەڵۆ، دەوری ٥٥ سانتیمیتر دەبن، لە سەر دار هێلانە ساز دەکەن، بۆ ڕفاندنی جووچک و مریشک بەناوبانگن ٢. بادەوەی لە کاغەز؛ تەیارەی کاغەزی ☰ ١. کورکور ٢. هواپیمای کاغذی

**کۆلاس** / kolas/: ناو. کۆلاسە؛ فیشەک کێشی تفەنگ ☰ گلنگدن

**کۆلاسە** / kolase/: ☜ **کۆلاس**

**کۆلاو** / kolaw/: ناو. گەرمەشین؛ خەمی گەورە ☰ اندوه گران؛ غم بزرگ

**کۆلفەمە** / kolfeme/: ناو. کاری هەوەڵ کوتانی چەڵتووک بە دنگ ☰ عمل برای بار اول کوبیدن شالی با دنگ

**کۆلک** / kol(i)k/: ناو. ١. کۆتە؛ پارچە داری ئەستوور ٢. پنج و ڕەگ ٣. کەپر ٤. داری نیشانە و ئامانجی جلیتبازی ٥. زیپکە لە پێست ☰ ١. کُندە ٢. بیخ و ریشە ٣. کپر ۴. کندەی آماج جریتبازی ۵. جوش بر پوست

**کۆلکانە** / kolkane/: ناو. کلکەوانە؛ ئەنگوستیلە؛ هەنگوسیلک ☰ انگشتری

**کۆلکە**[1] / kolke/: ناو. کۆلک: ١. داری ئەستوور ‹کۆلکە دار› ٢. کۆک؛ بنج و ریشە ☰ ١. کُندە ٢. ریشە و بن

**کۆلکە**[2]: ئاوەڵناو. کۆلکە؛ ناتەواو ‹کاری کۆلکە بێکەلکە «مەسەل»› ☰ ناتمام

**کۆلکە ـ**[3]: پێشوشە. نیوە ـ ‹کۆلکەمەلا› ☰ نیمە ـ

**کۆلکەڕەنگینە** / kolkeřengîne/: ☜ **کۆلکەزێرینە**

**کۆلکەزێرینە** / kolkezêrîne/: ناو. کۆلکەڕەنگینە؛ کولکەزێرینە؛ کۆڵەکەڕەنگینە؛ کۆڵەکەزێرینە؛ کۆڵەکەزەرینە؛ کەسکوسۆر؛ کەسکوسوور؛ کەسکەسۆر؛ کەلەستوون؛ کێرستوون؛ کێلستوون؛ ئەستوونەزێرینە؛ پەلکەڕەنگینە ‹کۆلکەزێرینە، وەکوو تاقی زەفەر/ ئاسمان بۆ منی بەست، کاتی سەفەر «سوارە»› ☰ رنگین‌کمان

**کۆلکەشاعیر** / kolkeşa'îr/: ئاوەڵناو. *[پلار]* شاعیرۆکە؛ شاعیری ناتەواو ☰ نیمچه شاعر

**کۆلکەمەلا** / kolkemela/: ناو. *[پلار]* کۆلکەمەلا: ١. مەلای کەم سەواد و فەقیرۆکە ٢. مەلای تازە

پێگەیشتوو ☰ ١. آخوند بی‌سواد ٢. تازەآخوند

**کۆللاره / kollare/:** ☜ **کۆلاره**

**کۆلوبیر / kolubîr/:** ناو. جەغجەغە؛ چەرخ و گوریسی ئاو هەڵگوێستن لە بیر ☰ چرخ چاه

**کۆلۆس / kolos/:** ئاوەڵناو. کۆلۆش؛ کەلخۆت؛ کۆلۆز؛ ددان‌کەوتوو ☰ بی‌دندان

**کۆله[١] / kole/:** ☜ **کۆیله**

**کۆله ـ[٢]:** پێشوشە. قوله ـ کورت؛ کۆتا ‹کۆلەبڕ واتا: یاڵ‌کورت› ☰ کوتاه ـ

**کۆلەتی / koletî/:** ☜ **کۆیلەتی**

**کۆلەدار / koledar/:** ☜ **کۆیلەدار**

**کۆلەس / koles/:** ناو. مێورەی ڕەزی بە زەویدا ڕاکشاو ☰ تاک بر زمین خوابیده

**کۆلەک / kolek/:** ناو. قولنگە؛ زەنگن؛ پاچی دووسەر ☰ کُلنگ

**کۆلەکە / koleke/:** ناو. قوندک؛ کەدوو؛ کوندر؛ کدو؛ کوولەکە ☰ کدو

**کۆلەیی / koleyî/:** ئاوەڵناو. پەمەیی؛ دروستکراو لە پەموو ☰ پنبه‌ای

**کۆلی / kolî/:** ناو. ١. کۆلە؛ بەنی ٢. ئێزنگ؛ پووشکە و چرپی بۆ سووتەمەنی ☰ ١. برده ٢. هیزم

**کۆلیار / kolyar/:** ناو. کەسێ کە نووسراوان لە سەر بەرد هەڵئەکەنێ ☰ حکاک

**کۆلیج / kolîc/:** ناو. کۆلیژ؛ کۆلێج؛ بەشێکی تایبەت لە زانستگا ‹کۆلیجی زمان و ئەدەبیاتی کوردی زانستگای کوردستان› ☰ گروه

**کۆلی‌دار / kolîdar/:** ☜ **کۆیلەدار**

**کۆلیژ / kolîj/:** ☜ **کۆلیج**

**کۆلیژە / kolîje/:** ناو. تەنگژە؛ گیروگرفت ☰ گرفتاری

**کۆلیسک / kolîsk/:** ناو. ئامرازی کەوچک کۆڵین ☰ ابزار ساختن قاشق

**کۆڵیل / kolîl/:** ئاوەڵناو. خەمبار؛ خەفەتبار ☰ غمگین

**کۆڵینک / kolînk/:** ناو. ئامرازی دار کۆڵین ☰ ابزار حکاکی روی چوب

**کۆڵێج / kolêc/:** ☜ **کۆلیج**

**کۆڵ[١] / koł/:** ناو. ١. گوردی؛ سەرشان؛ قەڵاندۆش؛ قەڵادووشان ‹چوون لۆنگ مەجنوون بدەوش وە کۆڵدا/ بگێلوو وە هەرد پای سارای چۆڵدا «مەولەوی»› ٢. بار؛ ئەوەندە لە شتێ کە بە جارێ بگۆزرێتەوە ‹کۆڵێک ئاردمان بۆ بێنە!› ٣. کۆڵە؛ کۆڵبەند؛ کۆڵەپشتی؛ تێلەکە ٤. بێچووی پێ‌نەگەیشتووی هەندێک گیانەوەر ٥. لووشە؛ گیایەکی دەشتە دەخورێ ٦. ڕەبەت؛ سیپە؛ بەرگە ٧. مشت؛ مستەکۆڵە ٨. بەرێک لە بەرەکانی دارمازوو ☰ ١. گُرده؛ قلمدوش ٢. بار ٣. کوله‌پشتی ۴. بچه‌ی کوچک برخی جانوران ۵. والک ۶. کمین شکارچی ۷. مُشت ٨ از محصولات مازو

⊡ **کۆڵ پێ دان:** بەزاندن ☰ شکست دادن

**کۆڵ دان:** ١. شەکەت بوون و دەست بەردان لە کار ٢. تەسلیم بوون ‹عەرد ئەزانێ پیرەمەگروون کۆڵی دابوو/ با ئەزانێ ئەژنۆی سەرماوەز ئەلەرزی «شێرکۆ»› ☰ ١. خسته و ناامید شدن ٢. تسلیم شدن

**کۆڵ کردن:** گرتنە کۆڵەوە؛ بەکۆڵەوە گرتن؛ لە کۆڵ کردن، خستنە کۆڵەوە؛ دانە کۆڵەوە؛ لە سەر پشت دانان ☰ کول گرفتن/ گرفتن

**کۆڵ کێشان:** بار کێشان بە کۆڵ ☰ پشته حمل کردن

**کۆڵ هەڵگرتن:** تێلەکە نانە سەر شان و پشتەوە ☰ بار بر دوش گذاشتن

**بە کۆڵەوە گرتن:** ☜ **کۆڵ کردن**

**خستنە کۆڵەوە:** ☜ **کۆڵ کردن**

**دانە کۆڵەوە:** ☜ **کۆڵ کردن**

**گرتنە کۆڵنەوە:** ☜ **کۆڵ کردن**

**لە کۆڵ کردن:** ☜ **کۆڵ کردن**

**لە کۆڵ کردنەوە:** لابردن و نەهێشتنی شتی ئازاردەر و پڕزەحمەت ‹ئەو منالانەم لە کۆڵ کەوە، با دوو کار بکەم›. هەروەها: **لە کۆڵ بوونەوە** ≡ از دوش برداشتن

**کۆڵ**[2]: ئاوەڵناو. ١. خاو؛ کاڵ؛ نەکولاو ٢. کاڵ؛ کرچ؛ نەگەیشتوو ٣. /کینایە/ ناشارەزا لە کار ٤. بێدەسەلات؛ لێنەوەشاو ‹هەموو کەس با بزانێ من کە سەودای زولفی دووتاتم/ لە خانەی کولمدا کۆڵم، بە فەرزی شای ڕوخت ماتم «حەریق»› ٥. بێشاخ (ئاژەڵ) ٦. قامکپەڕیو ٧. نووکپەڕیو (دەرزی و سووژن و...) ٨. کول؛ قوت؛ ڕووت ‹سەر کۆڵ› ٩. کول؛ نەتیژ ≡ ١. خام؛ ناپختە ٢. کال؛ نارس ٣. ناشی ۴. ناتوان؛ ۵. بی‌شاخ (دام) ۶. انگشت قطع شده ۷. نُک‌شکستە (سوزن و...) ۸. طاس ۹. کُند

◻ **کۆڵ کردن:** ١. کەرت کردن (وەک: سەر نووکی تیژ پەڕاندن) ٢. پەڕاندن؛ قرتاندن (وەک: سەرپەنجە) ≡ ١. نوک تیز چیزی را شکستن ٢. چیزی را قطع کردن

**کۆڵ -**[3]: پێشوشە. شان؛ سەرشان ‹کۆڵبەر؛ کۆڵگێڕ› ≡ کول -

**- کۆڵ**[4]: پاشەوشە. ـــ کۆڵ؛ کۆڵەر ‹زەویکۆڵ؛ کانکۆڵ› ≡ - کاو؛ کاوندە

**. کۆڵ**[5]: پاشگر. چکۆلە ‹کەرکۆڵ› ≡ - ک

**کۆڵ**[6]: پێرۆ. ← **کرژوکۆڵ**

**کۆڵان**[1] / kołan/: چاوگ. هەڵکۆڵین؛ دانەوە ≡ کاوش کردن

**کۆڵان**[2]: ناو. کووچە ≡ کوچە

**کۆڵانپێچ** / kołanpêç/: ناو. دۆڵ و گەوەی نێو شاخ و زەردوماهـ ≡ درّەی سنگی در صخرە

**کۆڵاندن** / kołandin/: چاوگ. دانەوە؛ هەڵکۆڵین؛ هەڵدانەوە ≡ کاویدن

**کۆڵانکوت** / kołankut/: ☜ **کۆڵانگەڕ**

**کۆڵانگەڕ** / kołangeř/: ناو. /کینایە/ کۆڵانکوت؛ کەسێ کە زۆر بە کووچە و کۆڵاناندا دەخولێتەوە ≡ کوچەگرد

**کۆڵانماڵ** / kołanmał/: ناو. سپوور؛ پاکەوان؛ زبڵڕێژ ≡ رُفتگر

**کۆڵانەباخ** / kołanebax/: ناو. بانوان؛ کووچەباخ ≡ کوچەباغ

**کۆڵانەوە** / kołanewe/: چاوگ. ١. زەوی دانەوە ٢. تۆژینەوە لە کار و بار ≡ ١. زمین کندن ٢. پژوهش کردن

**کۆڵبەر** / kołber/: ناو. کۆڵکەر؛ بارکێش ≡ کولبر

**کۆڵبەری** / kołberî/: ناو. باربەری ≡ حمّالی

**کۆڵبەند** / kołbend/: ناو. کۆڵە؛ تێلەکە ≡ کولەپشتی

**کۆڵدراو** / kołd(i)raw/: ئاوەڵناو. کەناو؛ هەڵکەنراو؛ کنیاگ؛ هەڵقەنراو ≡ کندە شدە

**کۆڵران** / kołran/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //کۆڵرای؛ دەکۆڵرێی؛ بکۆڵرێ// هەڵکەندران؛ هەڵکنیان ≡ کندە شدن؛ کاویدە شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: کۆڵراو/ چاوگی نەرێنی: نەکۆڵران

**کۆڵراو** / kołraw/: ئاوەڵناو. هەڵکەنراو؛ ناو خاڵی کراو ≡ کاویدە شدە

**کۆڵکۆڵێن** / kołkołên/: ناو. بارباراننێ؛ باربارکێ؛ بارەخوێیانێ ≡ از بازی‌های نوجوانان

**کۆڵکە -** / kołke-/: پێشوشە. کۆڵکە؛ ناتەواو ‹کۆڵکەمەلا؛ کۆڵکەپیاو› ≡ نیمە - ؛ ناتمام

**کۆڵکەر** / kołker/: ناو. ١. کولکەر؛ جلشۆر ٢. ☜ **کۆڵکێش** ≡ ١. رختشو ٢. ☜ **کۆڵکێش**

**کۆڵکێش** / kołkêş/: ناو. کۆڵکەر؛ حەماڵ؛ کەسێ کە لە سەر پشت شت دەگوێزێتەوە ≡ حمّال؛ باربر

**کۆڵگە / kołge/**: ناو. ۱. ڕەبەت؛ بۆسە؛ سیپە؛ بەرگە ۲. جێ کۆ بوونەوەی ڕاوکەران لە دەوری یەک ☚ ۱. کمین شکارچی ۲. جای أتراق شکارچیان

**کۆڵگەڕ / kołgeř/**: ناو. چەرچی؛ دێوەرە ☚ پیلەور

**کۆڵگێر / kołgêř/**: ناو. چەرچی؛ دێوەرە؛ کەسێ کە کەلوپەل بە کۆڵ دێنێ بۆ فرۆشتن ☚ پیلەور؛ فروشندەی دورەگرد

**کۆڵمت / kołmit/**: ☜ **کلۆت**

**کۆڵنج**[1] **/ kołinc/**: ناو. کولنج؛ قۆلنج؛ قولنج؛ سانجن؛ برک؛ شانەڕەقە؛ ئێشی زۆری (زیاتر ناو زگ) بە هۆی گرتن و بەردانی ماسوولکە و دەماری ئەندامێک (وەک: زگ، ڕێخۆڵە و...) لە ناو سکدا ☚ قولنج

◘ **کۆڵنج تەقاندن**: ☜ **کۆڵنج شکاندن**

**کۆڵنج شکاندن**: کۆلنج تەقاندن؛ شێلانی کۆڵنج و گووشینی تا قرچەی لێوە دێ ☚ قولنج شکستن

**کۆڵنج شێلان**: ناو شان مالین ☚ مشت‌ومال دادن شانەها

**کۆڵنج کردن**: با دە ناو شان وەستان ☚ میان کتف بە درد آمدن از سرما

**کۆڵنج**[2]: ئاوەڵناو. فەریک؛ کرچوکاڵ ☚ کال

**کۆڵنجان / kołincan/**: ناو. خۆلنجان؛ گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ ☚ خولنجان

**کۆڵنجگە / kołincge/**: ناو. نێوان هەر دووک شان ☚ میان هردو شانە

**کۆڵنجە / kołince/**: ناو. ۱. دانی دەخلی فەریک ۲. گولەدەغڵ یا ئالفی نەدووراو ۳. *[مەجاز]* کچی تازە پێگەیشتوو ☚ ۱. دانەی غلەی دلمل ۲. بخش کوچکی از غلە یا علف کە درو نشدە ۳. دختر نورسیدە

◘ **کۆڵنجە بۆ کەسێ دابڕین**: ۱. بەشێ لە کاری دەغڵ یا ئالف بۆ کەسێ‌تر جێ هێشتن ۲. *[کینایە]* زرنگ‌تر و بەدەست و بردتر بوون لە کەسێ ☚ ۱. بخشی از کار درو را برای دیگری باقی گذاشتن ۲. از کسی زرنگ‌تر بودن

**کۆڵنجی / kołincî/**: ناو. دووپشک؛ دەمارەکۆڵ ☚ عقرب

**کۆڵنەدەر / kołneder/**: ئاوەڵناو. نەبەز ☚ تسلیم‌ناپذیر

**کۆڵنەمە / kołneme/**: ناو. یەکەم‌جاری برینج‌کوتان لە دینگدا ☚ اولین نوبت برنج‌کوبی

**کۆڵوانە / kołwane/**: ناو. کۆڵەوانە؛ چارەکە؛ چارۆکە ☚ شنل؛ رودوشی زنانە

**کۆڵوبار / koł û bar/**: ناو. پشتە؛ باری کۆڵ ☚ کولەبار

**کۆڵوشیر / koł û şîr/**: ☜ **کۆڵەشێر**

**کۆڵوەس / kołwes/**: ناو. کۆڵەبەس؛ کۆڵەبەست؛ کۆڵەوەز؛ کۆڵەوەس؛ ئاوەنیا؛ زڕکوڕێ کە ژن دەگەڵ خۆی هێناوە ☚ ناپسری؛ پسرِ همسر از شوهر قبلی

**کۆڵۆز**[1] **/ kołoz/**: ناو. کلێتە؛ کلاوی لە بەن چندراو ☚ کلاه پشمی

**کۆڵۆز**[2]: ئاوەڵناو. ۱. ڕەق و تەق و کز ۲. کلۆز؛ کلۆز؛ ددانی پێشەوە کەوتوو ☚ ۱. لاغر و بی‌نا ۲. دندان پیشین افتادە

**کۆڵۆزبابە / kołozbabe/**: ناو. گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ ☚ گیاهی دارویی

**کۆڵۆس / kołos/**: ☜ **کلۆس**

**کۆڵۆش / kołoş/**: ☜ **کۆلۆس**

**کۆڵو / kołû/**: ناو. ۱. بنەتالوو؛ بێخی تالە کە بۆ سووتانی زستانە دەریدەهێنن ۲. هەویری لە ناو تەندووردا سووتاو ☚ ۱. ریشەی گیاهی کە بە جای هیزم بە کار می‌رود ۲. فرزدق؛ خمیر سوختە در تنور

**کۆڵە**[1] **/ kołe/**: ناو. ۱. کۆڵ؛ کۆڵبەند؛ کۆڵەپشتی؛ تێلەکە ۲. بێچووی چەند حەیوانێکی کێوی (کۆلەورچ؛ کۆڵەبەراز) ۳. کۆلوو؛ بنەتالوو ٤. پنج و

ڕەگ ٥. قسەی بێتام ٦. خۆڵەمێشی تەندوور ٧. منالی باوکمردوو کە دایکی شوو ئەکات و ئەیهێڵێ ٨. کولەسە؛ لانی سەگ ≣ ١. کولەپشتی ٢. بچەی چند جانور کوهی ٣. ریشەی گیاهی کە بە جای هیزم بە کار می‌رود ۴. بیخ و بن گیاه ۵. یاوە ۶. خاکستر تنور ۷. یتیمی کە مادرش شوهر کردە و او را بی‌سرپرست گذاشتە است ۸. سگدانی

⊡ **کۆڵە کوتران:** لێقەومان و کۆڵەوار بوون ≣ بیچارە شدن

**کۆڵە**[٢]: ئاوەڵناو. ١. پەنجەسەقەت ٢. چکۆڵەی خڕ (بۆ شووتی) ‹شووتیلە کۆڵە› ٣. لە کار ناشارەزا ٤. بێشاخ؛ شاخ‌پەڕیو ‹سم سوا تاکوو گەییم بەو هۆڵە/ شاخ نەما بوومەتە بزنی کۆڵە «حەقیقی»› ٥. تایبەتمەندی دەخڵێ کە درنگ پێدەگا ≣ ١. ناقص از ناحیەی انگشت ٢. کوچولوی گرد (هندوانە) ٣. ناوارد ۴. شاخ‌شکستە ۵. دیررس (غلە)

**کۆڵە -**[٣]: پێشوشە. ١. هی سەرشان ‹کۆڵەپشتی؛ کۆڵەبار› ٢. باری سەرشان ‹کۆڵەوەس› ٣. کورت؛ کۆتا ‹کۆڵەڕم› ≣ ١. ـ پُشتی ٢. ـ دوشی ٣. کوتاە

**- کۆڵە**[٤]: پاشەوشە. ١. گچکەی خڕ ‹وتیان: سەرت لە هەنبیەکۆڵە ئەچێ. وتی: هەنبیەکۆڵە ئەخوەم! «قسەی نەستەق»› ٢. بێچووی گچکەی بڕێ گیانەوەر ‹تووتەکۆڵە؛ ورچەکۆڵە› ≣ ١. گرد و کوچک ٢. بچەی کوچک (برخی جانور)

**کۆڵەبار / kołebar/:** ناو. کۆڵ؛ تێلەکە؛ پشتە ≣ کولەبار

**کۆڵەبەس / kołebes/:** ☜ **کۆڵوەس**

**کۆڵەبەست / kołebest/:** ناو. ١. ☜ **کۆڵوەس** ٢. کۆڵەوەس؛ ڕەپستە؛ ئاوەنیا؛ زەوی و زارێ کە ئاو دراوە و شۆ کراوە و تووی لێ چێندراوە و ڕوان و بەر دانی لێ بەدی دەکرێ ≣ ١. ☜ **کۆڵوەس** ٢. آبستە؛ بساردە

**کۆڵەبی / kołebî/:** ناو. جۆرێ دار بی ≣ نوعی بید

**کۆڵەپشت / kołepişt/:** ناو. کۆڵ؛ کۆڵە؛ تێلەکە؛ تێلەگە ≣ کولەپشتی

**کۆڵەپشتی / kołepiştî/:** ☜ **کۆڵە**[١] ـ١

**کۆڵەپنج / kołepinc/:** ناو. ڕەپستەی باش‌ڕواوی خۆ قایم‌کردوو ≣ کشت آبی پاییزەی خوب روییدە

**کۆڵەدار / kołedar/:** ناو. تێلەکە ئێزنگ ≣ پُشتەی هیزم

**کۆڵەر / kołer/:** ناو. ١. کەس یان شتی زەمین دەرەوە ٢. تۆژەر؛ تۆژەرەوە ≣ ١. زمین‌کاو ٢. پژوهشگر

**کۆڵەرەوە / kołerewe/:** ناو. پەیجۆر؛ تۆژەر ≣ پژوهشگر

**کۆڵەڕم / kołeřim/:** ناو. ١. نێزە؛ ڕمبی کورت ٢. بەرچیغ؛ خوترە؛ خوترەک؛ خوتەک؛ سنگی چیغ‌ڕاگر ≣ ١. نیزەی کوتاە ٢. میخ چوبین نگهدارندەی چیغ چادر

**کۆڵەزوانە / kołez(i)wane/:** ناو. پووشوو؛ پووشی؛ پیشۆ؛ پیفک؛ قاو؛ هەرچی زوو ئاگر بگرێ ≣ آتشگیرە

**کۆڵەزەرەر / kołezerer/:** ئاوەڵناو. *[پەلار]* دەستقلپ؛ ماڵ بە فیرۆدەر ≣ مال هَدَر دِه

**کۆڵەسی / kołesî/:** ناو. ١. کۆڵکە داری ئەستوور کە بۆ شلخەمێش دەکۆڵدرێ ٢. قەدی ئەستووری دار ≣ ١. کُندەی ستبر کە از آن کندو درست می‌کنند ٢. تنەی کُلفت درخت

**کۆڵەشێر / kołeşêr/:** ناو. کۆڵوشیر؛ دارێکی گەورە کە دەیدەنە بەر کۆڵەکەی ماڵ و بانەکەی پێ بەرز دەکەنەوە ≣ نوعی اهرم

**کۆڵەکوتراو / kołekutraw/:** ناو. لێقەوماو و زەلیل ≣ بیچارە

**کۆڵەکە / kołeke/:** ناو. ١. کۆڵەکێ؛ کولەگە؛ کۆڵەگە؛ ئەستوون؛ ستوون؛ ئەستوند ٢. چۆنیەتی لێک‌هالانی لقەکانی چێندراوی بە قەوەت (وەک:

گەنم، جـۆ و...) ☰ ١. سـتون ٢. چگـونگی بـه هـم پیچیدن ساقەهای محصول سبز و شاداب (مانند: گندم، جو و...)

⊡ **کۆڵەکە دان:** ئەستووندک دە ژێر شتێک دان بۆ ڕاگرتنی ☰ ستون زدن

**کۆڵەکـە کـردن:** بـە سـەر یەکـدا هەڵـچوون. هەروەها: **کۆڵەکە بوون؛ کۆڵەکە بەسـتن** ☰ روی هم تلنبار شدن

**ئاسمان کۆڵەکەی گەرەک بوون:** *[مەجاز]* زۆر سـەیر بوون؛ زۆر سەرسووڕێنەر بـوون ☰ بسیار دور از انتظار بودن

**کۆڵەکەجەڕە** / kołekeceře/: ناو. داری دووحاچەی ڕاگری چەرخی ئاو هەڵکێشان ☰ ستون دوشاخەی نگهدارندەی چرخ چاه

**کۆڵەکەڕەشکە** / kołekeřeşke/: نـاو. کۆڵـەکەیەکی سەر دوو فلیقانە، ڕەشکەکای لە سەر دادەنـێن ☰ پایەای برای نگهداری تور کاهکشی

**کۆڵـــەکـــەڕەنگینـــە** / kołekeřengîne/: ☜ کۆلکەزێڕینە

**کۆڵەکەزۆران** / kołekezoran/: ناو. ڕقەبەرایـەتی و ململانێ ‹ئەوە کۆڵەکەزۆران چەتانە؟ بیکەنە نۆرە!›. هەروەها: **کۆڵەکەزۆران بوون؛ کۆڵـەکەزۆران کـردن** ☰ مُحاجا

**کۆڵەکەزەڕینە** / kołekezeřîne/: ☜ کۆلکەزێڕینە

**کۆڵەکەزێڕینە** / kołekezêřîne/: ☜ کۆلکەزێڕینە

**کۆڵەکەوا** / kołekewa/: ناو. ئەستوونی بن کاریتـە ☰ ستون زیر بالار

**کۆڵەکێ** / kołekê/: ☜ کۆڵەکە ـ١

**کۆڵەگە** / kołege/: ☜ کۆڵەکە ـ١

**کۆڵەمست** / kołemist/: ناو. کۆڵەمشت؛ مشتەکۆڵە؛ مستەکۆڵە ☰ مُشت گره کرده

**کۆڵەمشت** / kołemişt/: ☜ کۆڵەمست

**کۆڵەندام** / kołendam/: ئاوەڵناو. زرۆپ؛ نوقسـتان؛ ڕینجۆ ☰ فلج؛ معلول

**کۆڵەوار** / kołewar/: ئاوەڵناو. ١. زۆر حـاڵ خـراپ ٢. *[کینایە]* ناتەواو؛ کەمبنیە ‹مەحموود... لە پـەرژ و بلاویشدا وەک مـن کۆڵـەوار بـوو! «هـەژار، چێشـتی مجێور»› ☰ ١. بدحال ٢. ضعیف؛ ناتوان

**کۆڵەوانە** / kołewane/: ☜ کۆڵوانە

**کۆڵەوژ** / kołewij/: ☜ کۆڵەوەژ

**کۆڵەوەز** / kołewez/: ☜ کۆڵوەس

**کۆڵـەوەژ** / kołewej/: نـاو. کۆڵـەوژ؛ کواناکـەش؛ پێلۆژە؛ دارکۆلک؛ دارێ کە خۆڵی بن تەنـدووری پێ تێکوەردەدەن ‹مەلای ڕانیە ـ کۆڵەوەژ لە سەر شان ـ دەنگی خەڵکی لـێ داوم: ئـەو کـافرە کـوفری کردووە! «هـەژار، چێشـتی مجێـور»› ☰ نـیم‌سـوز؛ آتش‌کاو تنور

**کۆڵـەوەس** / kołewes/: نـاو. ١. ☜ **کۆڵـوەس** ٢. ☜ **کۆڵەبەست ـ٢**

**کۆڵـەوێژ** / kołewêj/: ئاوەڵـناو. چەنـەوەری قسـە بێ‌تام ☰ یاوەگو

**کۆڵهەڵگر** / kołhełgir/: ناو. کۆڵـکێش ☰ حمّال؛ باربر

**کۆڵی**[١] / kołî/: ناو. کەمەندامی؛ مفرۆیی ☰ معلولیّت

**کـۆڵی**[٢]: ئاوەڵـناو. ١. بیابـانی؛ چۆلپەرسـت؛ نیشتەجێی دەشت ٢. ناشی؛ لـەکار نـەزان ☰ ١. بیابانی ٢. ناشی

**کۆڵیت** / kolît/: ناو. کولـیتە: ١. کۆختـە؛ کـەویل ‹کۆلیتـی هـەژار› ٢. کولانـە مریشـک ٣. داری کۆلدراو بـۆ میـوە گوشـین ☰ ١. کـوخ ٢. لانـەی ماکیان ٣. کُندەی مخصوص فشردن میوە

**کۆڵین** / kołîn/: چـاوگ. تێـپەڕ. //کۆڵـیت؛ دەکۆڵـێ؛ بکۆڵە// ١. زەوی و... دانەوە ٢. ناوەی دار و بەرد دەرهێنان ☰ ١. کندن زمین و... ٢. حفر کردن سنگ و چوب

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەکۆڵین

**کۆلینەوە / kołînewe**/: چاوگ. تێپەڕ. //کۆلیتەوە؛ دەکۆلیەوە؛ بکۆلەوە// ١. لە زەوی گەڕان بۆ شتێ ٢. توێژینەوە ☰ ١. کاویدن زمین ٢. پژوهش کردن

■ ئاوەلناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەکۆلینەوە

**کۆلێ**[1] / **kołê**/: ئاوەلناو. زۆرێک؛ فرەیەک ‹لە سایەی دەهری دوونپەروەر ئەمێستە لەک لە لەک ئەدوێ/ بە کۆلێ کلکەوە ڕێوی لەگەل کەولی دەلەک ئەدوێ «شێخ ڕەزا»› ☰ بسیاری

ـ **کۆلێ**[2]: پاشگر. ـــۆکە؛ گچکەی خۆشەویست ‹یارکۆلێ؛ نازکۆلێ› ☰ پسوند تصغیر و تحبیب

**کۆم**[1] / **kom**/: ناو. ١. قوون؛ قنگ ٢. ئالقەی دارینی درگا داخستن ٣. کۆ؛ توێپەل؛ کۆگا ٤. کلاو ☰ ١. مقعد ٢. کلون؛ قفل چوبی در ٣. توده ۴. کُلاه

◻ **کۆم بوون**: ☜ **کۆم بونەوە**

**کۆم بونەوە**: کۆم بوون؛ کۆ بوون لە دەوری یەک ☰ جمع شدن

**کۆم**[2]: ئاوەلناو. پشتکووڕ ☰ کوژپشت

◻ **کۆم بونەوە**: کۆمەو بوون: ١. داهاتنەوە ٢. کۆم بوون؛ کووڕ بوون؛ پشت چەمانەوە ☰ ١. خم شدن ٢. پشت خمیدن

**کۆمەو بوون**: ☜ **کۆم بونەوە**

**کۆما / koma**/: ناو. ١. توێپەل؛ کۆگا؛ کۆ؛ ئەوەی بە سەر یەکدا کەلەکەی بەستووە ٢. دۆخی بێهۆشی و لە دەست دانی قوولی هۆش ☰ ١. توده ٢. کُما

**کۆماج / komac**/: ناو. ١. ئەستوندەکی چادر ٢. هەورەبان؛ کۆمانج؛ شوو؛ خەرپشتە؛ ئۆدەیێ کە لە سەر پلیکانی سەربان دەیکەنەوە ٣. جۆرێ نان ٤. بوغاری؛ کوورەی لە ناو دیوار چێ کراو ٥. تەوەرەی ئاسیاو ☰ ١. ستون چادر ٢. خرپُشته ٣. نان کُماج ۴. شومینه؛ بخاری دیواری ۵. ابزاری در آسیاب

**کۆماجە / komace**/: ناو. کۆترە؛ داری نێوان ئەستوون و میچی خانوو ☰ چوب رابط ستون و سقف

**کۆمار / komar**/: ناو. ١. عەشرەت؛ خێل؛ عێل ٢. حەشامات؛ ئاپۆرە ٣. کۆماری؛ جڤاتی ‹کۆماری مەهاباد› ☰ ١. ایل؛ عشیرت ٢. جمعیت مردم ٣. جمهوری

**کۆماری**[1] / **komarî**/: ناو. جڤاتی؛ کۆمەلی؛ حوکمەتێ کە خەلک سەرۆکیان هەلدەبژێرن ☰ جمهوری

**کۆماری**[2]: ئاوەلناو. پێوەندیدار یان سەر بە کۆمار ☰ جمهوری

**کۆمال / komał**/: ناو. کۆدێن؛ کۆمەلەخانووی لە پەنای یەک ☰ مُجتمع مسکونی

**کۆمانج / komanc**/: ناو. ١. ئەستوندەکی چادر ٢. بانی پێلەی ئاو ڕانەگر ٣. کۆماج؛ هەورەبان؛ ئۆدەی سەر پلیکانی سەربان ☰ ١. ستون خیمه ٢. بامی که آب در آن جمع نشود ٣. خرپُشته

**کۆماو / komaw**/: ☜ **کۆماوە**

**کۆماوە / komawe**/: ئاوەلناو. کۆماو؛ کۆمۆ؛ چەماو؛ پشتکووڕ ☰ کوژپشت

**کۆماوەر / komawer**/: ناو. ئاپۆرە؛ گرسەی خەلک؛ گرۆزەی خەلک ☰ جمهور؛ تودەی مردم

**کۆمبەها / kombeha**/: ناو. نرخی شت سەرجەم و بە تێکڕایی ☰ بهای عُمدەفروشی

**کۆمبێژ / kombêj**/: ناو. ١. کاری گۆرانی وتنی بە کۆمەل ٢. گەڕەلاوژە؛ کاری بە نۆرە گۆرانی خوێندن ☰ ١. ترانەخوانی دستەجمعی ٢. آواز خوانی نوبتی

**کۆمر / komir**/: ناو. زوخال؛ خەلووز؛ ڕەژی؛ ڕەژوو ☰ زُغال

**کۆمرە / komre**/: ناو. کۆمڕ؛ ئاپوورەی مرۆ؛ کۆی حەشامات ☰ اجتماع مردم

**کۆمڕ / komiř/**: ☜ **کۆمڕە**

**کۆمڕەش / komřeş/**: ناوەڵناو. /شووڕەیی/ ١. بەخیل؛ بە ئیرەیی ٢. /کینایە/ عاجز؛ وەڕەز؛ جاڕز ٣. /پەلار/ ئیرانی ☰ ١. حسود ٢. بیزار ٣. ایرانی

**کۆمفرۆش / komf(i)roş/**: ☜ **کۆفرۆش**

**کۆمک / komik/**: ☜ **کاکەشان**

**کۆمکاسێویان / komkasêwyan/**: ☜ **کاکەشان**

**کۆمگە / komge/**: ناو. عەمبار؛ هەمار ☰ انبار

**کۆمنەیەرە / komneyere/**: چاوگ. داچەماندنەوە ☰ خم کردن

**کۆمۆ / komo/**: ☜ **کۆماوە**

**کۆمە / kome/**: ناو. ١. کۆما؛ کۆ ٢. سیپەی ڕاوکەر لە چیلکە و چاڵ ☰ ١. تودە ٢. کمین شکارچی از ترکە و نی

**کۆمەک / komek/**: ناو. کۆمەکی؛ کۆمەگ؛ کۆمەگی؛ یارمەتی؛ ئاریکاری ☰ کمک

**کۆمە ـ کۆمە / kome kome/**: ناوەڵکار. ١. بە پشتی چەماوە ٢. کۆ ـ کۆ؛ کۆما ـ کۆما ☰ ١. حالت خمیدە ٢. تودە ـ تودە

**کۆمەکی / komekî/**: ☜ **کۆمەك**

**کۆمەگ / komeg/**: ☜ **کۆمەك**

**کۆمەگی / komegî/**: ☜ **کۆمەك**

**کۆمەڵ / komeł/**: ناو. کۆمەڵکە؛ کۆمیلکە: ١. کۆ؛ تۆپەڵ ٢. پڕایی مەردم ☰ ١. تودە ٢. تودەی مردم؛ جمهور

⊡ **کۆمەڵ بوون**: لە دەوری یەک کۆوە بوون ☰ دور هم جمع شدن؛ گرد هم آمدن

**کۆمەڵایەتی / komełayetî/**: ئاوەڵناو. سەر بە کۆمەڵ ‹کاری کۆمەڵایەتی› ☰ اجتماعی

**کۆمەڵپرسی / komałpirsî /**: ☜ **گشپرسی**

**کۆمەڵتە / komełte/**: ناو. کۆمەڵ ☰ تودە

**کۆمەڵژی / komełjî/**: ئاوەڵناو. گرۆژی؛ خاوەن ژیانی بەکۆمەڵ، بەرانبەر تاکژی ☰ گروەزی؛ اجتماعی

**کۆمەڵکە / komełke/**: ☜ **کۆمەڵ**

**کۆمەڵگا / komełga/**: ناو. ١. کۆمەڵگە؛ جڤات؛ جەماوەرێ کە لە سەر کۆمەڵە خاڵێک پێک کەوتوون و لە خۆشی و ناخۆشیدا پێکەوەن و یەک چارەنووسیان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە ٢. شوێن و جێگەی پڕایی خەڵک ‹بابایەکی خۆم ئاسایی کە بۆ خوێندن چووبێتە ناو کۆمەڵگای نوێی ئورووپایی «هەژار، *چوار نامیلکە*»› ٣. شوێن و جێگەی پڕایی هەر شتێ ‹مەنزوومەی تریش زۆر زۆرن/ کۆمەڵگای ئەستێرە و خۆرن «هەژار، *چوار نامیلکە*»› ☰ ١. جامعە ٢. محل اجتماع مردم ٣. مُجتمع

**کۆمەڵگە / komełge/**: ☜ **کۆمەڵگا**

**کۆمەڵناس / komełnas/**: ناو. کەسێ کە کاری ناسینی تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگایە ☰ جامعەشناس

**کۆمەڵناسی / komełnasî/**: ناو. زانستێ کە دەپەرژێتە سەر لێکدانەوەی تایبەتمەندیگەلی کۆمەڵگای مرۆڤ ☰ جامعەشناسی

**کۆمەڵە / komełe/**: ناو. ١. پڕایی خەڵک ٢. کۆمی چەن شت پێکەوە ‹کۆمەڵە شاخێک سەخت و گەردەنکەش/ ئاسمانی شینی گرتۆتە باوەش «گۆران»› ☰ ١. جمهور؛ تودەی مردم ٢. مجموعە

⊡ **کۆمەڵە بەستن**: کۆمەڵ بوون ☰ دور هم جمع شدن

**کۆمەڵێ / komełê/**: ئاوەڵکار. گەلێ؛ گەلێک؛ گەلدەس؛ گەلەک ☰ بسی

**کۆمی / komî/**: ناو. فاق؛ کووڕی ☰ خمیدگی

**کۆمیانەوە / komyanewe/**: چاوگ. نەوین؛ چەمانەوە ☰ خم شدن

**کۆمیلکە / komîlke/**: ☜ **کۆمەڵ**

**کۆمیەیەرە / komyeyere/**: چاوگ. داچەمان ☰

خم شدن

**کۆن**١ / kon/: ناو. ١. ڕەشماڵ؛ چادری هەوارچییان ٢. پارچەی ڕەشماڵ ■ ١. سیاه چادر ٢. پارچەی سیاەچادر

**کۆن**٢: ئاوەڵناو. کۆنە؛ کان؛ کوهۆن؛ کهانەی؛ کەعن؛ کەڤن؛ کەون؛ کەهەن؛ کەیەن: ١. قەدیمی؛ لەمێژینە ‹شارستانییەتی کۆن› ٢. زۆر دەکارهێنراو ‹کراسی کۆن› ٣. پێوەندیدار یان سەر بە کاتی پێشوو ‹زامی کۆن› ■ ١. قدیمی ٢. کارکردە ٣. کُهنە

**کۆن**ـ٣: ☜ کۆنە ـ٣

**کۆنا** / kona/: ئاوەڵناو. ١. زرینگ؛ وریا ٢. فێڵباز؛ فریودەر ■ ١. زرنگ ٢. مکّار

**کۆنای** / konay/: چاوگ. کۆنە کردن ■ کُهنە کردن

**کۆنبوو** / konbû/: ئاوەڵناو. کارینای؛ دەکارکراو ■ کارکردە؛ مُستعمل

**کۆنتولە** / kontule/: ☜ کۆنتۆ

**کۆنتۆ** / konto/: ناو. پارینە؛ کۆنتولە؛ پارگوێل؛ پارگوێر؛ بەچکە چێڵی دوو بەهاردیتوو ■ گوسالەی یکسالە

**کۆندۆ**١ / kondo/: ناو. چێڵێ کە ئاوس نەبووە و شیر دەدا ■ گاو آبستن نشدەی شیردە

**کۆندۆ**٢: ئاوەڵناو. ئاوس‌نەبووی شیردەر (ئاژەل) ■ آبستن نشدەی شیردە (احشام)

**کۆندیل** / kondîl/: ناو. قولاپە؛ قیتک؛ زۆپی هێلکەئاسایی سەری ئێسک کە دەکەوێتە نێو قوولایی پێشەی‌ترەوە ■ سر استخوان

**کۆنساڵ** / konsał/: ئاوەڵناو. بەساڵاچوو؛ پیر؛ بەتەمەن ■ سالخوردە

**کۆنسوول** / konsûl/: ناو. قونسوور؛ شابەندەر ■ کنسول

**کۆنفرانس** / konf(i)rans/: ناو. کۆڕبەند؛ کۆڕبەندی ■ کنفرانس

**کۆنک** / kon(i)k/: ناو. پەڕوپۆ؛ تووکی باڵدار ■ پر پرندە

⊡ **کۆنکی پیرێ**: جۆلاتەنەی جاڵجاڵووکە ■ تار عنکبوت

**کۆنکریت** / konk(i)rît/: ناو. کۆنکرێت؛ بیتۆنی بە میلەی ئاسنی قایم‌کراو ■ بتون آرمە

**کۆنکرێت** / konk(i)rêt/: ☜ کۆنکریت

**کۆنکۆڵ** / konkol/: ناو. دارێکی لێڕەوارە بەرێکی وەک پەمۆ دەگرێ ■ درختی جنگلی

**کۆنگ** / kong/: ناو. کونگ؛ کاکڵەی دار گوێز ■ مغز درخت گردو

**کۆنگرە** / kong(i)re/: ناو. کۆنگەرە؛ کونگیرە: ١. قۆنگرە؛ برجی سەر قەڵا ٢. کۆبوونەوە؛ یەکگرتنەوەی فەرمی نوێنەران، ناردراوان یان ئەندامانی یەک یان چەند گرۆی ڕامیاری، فەرهەنگی یان زانستی ■ ١. کُنگرەی قلعە ٢. کُنگرە؛ گردهمایی

**کۆنگەرە** / kongere/: ☜ کۆنگرە

**کۆنگیرە** / kongîre/: ☜ کونگرە

**کۆننشین** / konn(i)şîn/: ئاوەڵناو. چادرنشین؛ ڕەوەن؛ ڕەوەند ■ چادرنشین

**کۆنە**١ / kone/: ناو. ١. پەڕۆی دڕاو ٢. کوانوو؛ تفک ■ ١. وصلەی کُهنە ٢. اُجاق

**کۆنە**٢: ئاوەڵناو. ١. کارکردە ‹کەوشەکانم کۆنە بوون› ٢. لە مێژینە؛ بەتەمەن ٣. زرینگ؛ وریا ٤. فێڵباز؛ فریودەر ■ ١. کارکردە ٢. قدیمی ٣. زرنگ ٤. حیلەگر

**کۆنە**ـ٣: پێشوشە. کۆن ـ؛ کەونە ـ: ١. بەئەزموون؛ کارامە ‹کۆنەکار؛ کۆنەسوار› ٢. لەمێژینە؛ قەدیمی ‹کۆنسال؛ کۆنمال› ٣. لە پێشوودا ‹کۆنەگزیر؛ کۆنەئاغا› ٤. وێرانە ‹کۆنەخانوو› ■ ١. کارا ٢. قدیمی ٣. پیشین ٤. خرابە

**ــ کۆنــە**[٤]: پاشوشــە. دەکــارکراو؛ کــارکردوو ‹کەوشەکۆنە› 🇮🇷 مُستعمل

**کۆنەبیری / konebîrî/**: ☜ **کۆنەپەرستی**

**کۆنە پارێز / koneparêz/**: ☜ **کۆنەپەرست**

**کۆنە پۆش / konepoş/**: ناو. ١. کەسێ کـە جلکـی کۆنی لە بەردایـە ٢. *[کینایە]* مـرۆی تەرکـەدنیای خواخواز 🇮🇷 ١. ژندەپوش ٢. زاهد

**کۆنە پەرســت / koneperist/**: ئاوەڵــناو. *[پــلار]* کۆنەپارێز؛ پاشرۆ؛ کەڤنەپەرست؛ لایەنگری باوەڕ، بایەخ، داب و شێوەی ژیانی ڕابـردوان و سڵـەمان لە شتی نوێ 🇮🇷 مُرتجع

**کۆنە پەرستی / koneperistî/**: ناو. *[پلار]* کۆنەبیری؛ بیر و بڕوای کۆنەپەرست 🇮🇷 ارتجاع

**کۆنـە پـەڕۆ / konepeřo/**: نـاو. پاتــاڵ؛ ســیپاڵ 🇮🇷 بافتەی فرسودە

**کۆنەچاڵ / koneçał/**: ناو. *[کینایە]* ١. دۆستی کۆن؛ دۆسـتی جـاری جـاران ٢. شـوێنی لـە پێشـەوە ناسراو 🇮🇷 ١. دوست دوران گذشتە ٢. جای معهود

**کۆنەدۆس / konedos/**: ☜ **کۆنەدۆست**

**کۆنەدۆست / konedost/**: ناو. کۆنەدۆس؛ دۆستی لە مێژینە 🇮🇷 دوست قدیمی

**کۆنەژن / konejin/**: ناو. کەڤـنەژن؛ ژنی پێشـووی مێرد 🇮🇷 زن قبلی مرد

**کۆنەسـوار / kones(i)war/**: نـاو. ١. ســوارچاکی کارامـە ٢. دومـەکـژەنی زۆرخانـە 🇮🇷 ١. سوارکار ماهر ٢. تنبک‌نواز زورخانە

**کۆنەسێن / konesên/**: ناو. فرۆشـەری گـەڕۆک کـە جــلوبــەرگی کۆنــە دەکــڕێ و دەفرۆشــێ 🇮🇷 کهنەفروش

**کۆنـــەفرتۆڵ / konefirtoł/**: ئاوەڵــــناو. *[پــــلار]* بی‌بی‌جان‌جادو؛ پیرەبووک؛ دەڵەقۆڕ؛ قرچۆڵ؛ زۆر پیر و ناشیرین (ژن) ‹گێلی لات وا بێ ژیان تا ماوی هەر بۆ لایەکە/ کۆنـەفرتۆڵـی جیهـان هـەر تـاوە بـۆ زاوایەکە «هەژار، *شەرەفنامە*»› 🇮🇷 عجوزە

**کۆنـەفرۆش / konef(i)roş/**: نـاو. ١. کەسـێ کــە شتی قەدیمی مامەڵە دەکا ٢. ناڤچیت؛ سمسـار؛ کەســێ کــە کــەل‌وپــەلی دەکــارکراوی مــاڵان دان‌وسان دەکا 🇮🇷 ١. عتیقەفروش ٢. سمسار

**کۆنەفرۆشی / konef(i)roşî/**: ناو. ١. کــاری شــتی کۆنە و دەکارکراو سەندن و فرۆشتن ٢. دووکانی تایبەت بەو کارە 🇮🇷 ١و٢. سمساری

**کۆنـەقـین / koneqîn/**: نـاو. ڕق و دوژمنایـــەتی کۆنینە و لە دڵداماو ‹شەڕ بە کۆنەقینـەوە دەکـرێ› 🇮🇷 کینەی قدیمی

**کۆنەلان / konelan/**: ناو. کۆنەهێلانـە؛ کەونـەلان؛ پێچەوانەی گەرمەلان 🇮🇷 آشیانەی قدیمی

**کۆنـەنـەجـیم / konenecîm/**: ئاوەڵــناو. *[پــلار]* چەکمەبۆر؛ چەکمــەڕەق؛ بــەگزادەی نــابووت 🇮🇷 اشرافزادەی مُفلس

**کۆنەهـەوار / konehewar/**: نـاو. هــەواری کــۆن و ئـاوەدانی نـەماو؛ هـەواری چۆڵـکراو 🇮🇷 ییلاقگـاه قدیمی و خالی شدە

**کۆنەهێلانە / konehêlane/**: ☜ **کۆنەلان**

**کۆنی / konî/**: ناو. دۆخی کۆن بوون 🇮🇷 کُهنگی

**کۆنیــاک / konyak/**: نــاو. قۆنیـــاغ؛ جــــۆرێ خواردنەوەی ئەلکولییە لە شەراوی سپی بەرهــەم دێ 🇮🇷 کُنیاک

**کۆنینە / konîne/**: ئاوەڵناو. زۆر قەدیمی 🇮🇷 دیرینە

**کۆنینـەناس / konînenas/**: نـاو. دێرینـــەناس 🇮🇷 دیرینەشناس

**کۆنیـەتـی / konyetî/**: نـاو. کەیــەنی؛ کــۆنی 🇮🇷 کُهنەای

**کۆوک / kowik/**: ☜ **کەو-١**

**کۆوە / kowe/**: ناو. بەران؛ نێرەمەڕ؛ قۆچ؛ پەزی نێر 🇮🇷 قوچ

**کۆوەکەر / koweker/**: ناو. بەرهەڤکار 🇮🇷 جمع‌کنندە

**کـۆوی** / kowî/: نـاو. بزنـەکێوی؛ بزنـەکێفی؛ کەڵەکێوی 🇮🇷 بُز کوهی

**کۆیای** / koyay/: چاوگ. کۆنە بوون 🇮🇷 کهنه شدن

**کۆیلە** / koyle/: ناو. کۆلـە؛ کـۆلی؛ بـەنی؛ بەنـدە؛ عەبد 🇮🇷 برده

**کۆیلـەئاسـا** / koyle'asa/: ئاوەڵـناو. بەنـدەوار 🇮🇷 غلام‌آسا

**کۆیلەتی** / koyletî/: نـاو. کۆلـەتی؛ بەنـدەیی 🇮🇷 بردگی

**کۆیلەدار** / koyledar/: ئاوەڵناو. کۆلەدار؛ کـۆلی‌دار؛ خاوەن بەنی 🇮🇷 برده‌دار

**کۆیوسان** / koyusan/: ☜ **کۆیستان**

**کو**[1] / kû/: ناو. ۱. چیا؛ کێو؛ کێف ۲. ☜ **کەدوـ۱** 🇮🇷 ۱. کوه ۲. ☜ **کەدوـ۱**

▣ **کـوی قـەباخی**: کوولەکـەی شـەقەباخی 🇮🇷 کدوحلوایی

**کوی ملگە**: کوولەکە سەراوی 🇮🇷 نوعی کدو

**کو**[2]: ئاوەڵکار. چلـۆن؛ چـۆن؛ چـاوان ‹ئەڤـە کـوو دەخوریٚ؟› 🇮🇷 چگونه

**کو**[3]: ئامراز. کە ‹کوو ئەڤها بت› 🇮🇷 که

**کـوپ**[1] / kûp/: نـاو. ۱. پیاڵـە؛ شـەبک؛ فینجـان؛ دەفری بچووکی دەم‌هەراوی دەسکدار ۲. هومـە؛ کووپـە؛ دەفـری سواڵـەتی زل و دەم‌ئاواڵـە 🇮🇷 ۱. فنجان ۲. خُم

**کوپ**[2]: ئاوەڵناو. کپ؛ بێدەنگ و مات 🇮🇷 بی‌سروصدا

**کوپان** / kûpan/: چاوگ. قوپـان؛ قوپیـان 🇮🇷 گـود شدن

**کوپانـدن** / kûpandin/: چاوگ. قوپانـدن؛ قوپـانن 🇮🇷 گود کردن

**کوپە** / kûpe/: نـاو. ۱. کـووپ؛ دەفـری زەلامـی سواڵەتی ‹زگ کووپە نییە لەمەی جمەی بـیٚ دەم و ژەم/ بـۆ لەمپـەری خـەم، دەم ـ دەم و کـەم ـ کـەم خۆشـە «هـەژار، *چوارینـەکانی خـەییام*»› ۲. کەڵەشاخی حەجامـەت ۳. خاڵـێکی سـوورە لـە پەڕی قوماردا ٤. کۆ گیای لە سەر یـەک دانـدراو 🇮🇷 ۱. خُم ۲. شاخ حجامت‌گیری ۳. دل؛ خالی در ورق بازی ۴. کوت؛ تودەی گیاه درویده

**کوپەرە** / kûpere/: ☜ **کوپەڵە**

**کوپەڵۆکە** / kûpełoke/: ناو. کووپەی زۆر پچووک 🇮🇷 خُم بسیار کوچک

**کوپـەڵـە** / kûpełe/: نـاو. کووپـەرە؛ کووپـەی پچووک 🇮🇷 خُم کوچک

**کـوت** / kût/: نـاو. ۱. کـوود؛ هەرچەشـنە بژیـوی گژوگیا کـە بـۆ بـەهێز کـردنی خـاک، لـیٚ زیـاد دەکەن ۲. دۆخێکی تایبەت لە بڕیٚ کایـەدا 🇮🇷 ۱. کود ۲. اصطلاحی در بازیِ ورق

▣ **کوت دان**: پەین بە بن زرعاتەوە کـردن 🇮🇷 کـود دادن کشت

**کـوت کـردن**: ۱. پـەین دان بـە زرعـات ۲. بردنەوەی کایە بەبیٚ دەسیٚ دان بە حەریف 🇮🇷 ۱. کود دادن ۲. بردن حریف بدون دادن امتیاز

**کـوتاڵ** / kûtał/: ناو. کاڵا؛ شرە و بـرەی بازرگـانی 🇮🇷 کالا؛ قماش

**کـوتاڵفرۆش** / kûtałf(i)roş/: نـاو. بـەزاز؛ پارچەفرۆش 🇮🇷 بزّاز

**کوتاڵفرۆشی** / kûtałf(i)roşî/: نـاو. بـەزازی 🇮🇷 بزّازی

**کوت ـ کوت** / kût kût/: دەنگەناو. کووتی ـ کووتی؛ وشەی بانگ کردنی سـەگ 🇮🇷 واژەای بـرای صـدا زدن سگ

**کوتۆز** / kûtoz/: ☜ **کڵاو ـ۱**

**کوتـە** / kûte/: نـاو. ۱. قـەزوان و تـۆمی پێکـەوە کوتراو ۲. تووتەسەگ ۳. جۆریٚ خەیاری درێژ 🇮🇷 ۱. نانکش و تخمەی با هم کوبیـده ۲. تولـەسگ ۳. نوعی خیار

**کوتەڵ** / kûtel/: ناو. دۆڵیان؛ دۆڵاش 🇮🇷 ناو آسیا

**کوتی** / kûtî/: ناو. ١. بەڵەکی ٢. گولی ٣. سەگ ☰ ١. برص ٢. جُذام ٣. سگ

**کوتی ـ کوتی** / kûtî kûtî/: ☜ **کوت ـ کوت**

**کوتێک** / kûtêk/: ناو. بەڕوولەی تازە ☰ خیار تازه درآمده از بوته

**کوجی** / kûcî/: ناو. کۆلان؛ کووچە؛ ڕاڕەوی تەنگ لە ناو دوو ڕیزە خانوودا ☰ کوچه

**کوچ**[١] / kûç/: ☜ **کوچەك**

**کوچ**[٢]: ئاوەڵناو. ١. تایبەتمەندی کەسێ کە ئەنگوستی لە پێنج کەمترە ٢. تایبەتمەندی کەسێ کە ئەنگوستی پێکەوە چەسپاوە ٣. کۆڵە؛ بێشاخ ☰ ١. ناقص انگشت ٢. انگشت بە هم چسپیده ٣. بی‌شاخ

**کوچان** / kûçan/: ئاوەڵناو. لیپاولیپ؛ پڕ ☰ لبریز

**کوچک** / kûçik/: ☜ **کوچەك**

**کوچە** / kûçe/: ☜ **کوجی**

**کوچەباخ** / kûçebax/: ناو. بانوان؛ تەلان؛ کۆلانەباخ ☰ کوچەباغ

**کوچەک** / kûçek/: ناو. کووچ؛ کووچک؛ سەگ ☰ سگ

**کوچی ـ کوچی** / kûçî kûçî/: دەنگ. وشەی بانگ کردنی سەگی چکۆلە و تووتک ☰ واژەای صدا زدن تولەسگ

**کوخەل** / kûxel/: ناو. خەرمانەوان؛ نگابانی خەرمان ☰ نگهبان خرمن

**کوخیان** / kûxyan/: چاوگ. کۆخین؛ قۆزین ☰ سُرفه کردن

**کوخیاندن** / kûxyandin/: ☜ **کۆخاندن**

**کود** / kûd/: ☜ **کوت ـ١**

**کودەری** / kûderî/: ناو. چەشنێ پارچەی بەنی نەرم کە زۆرتر بۆ ژێرپۆشی ژنانە و بەرگی منداڵان بە کار دێ ☰ پارچەی کودری

**کودەڵە** / kûdełe/: ناو. بەچکەبەراز ☰ بچەخوک

**کودەڵەبەراز** / kûdełeberaz/: ناو. بزەڵە؛ باقۆڵە؛ بەچکە بەراز ☰ بچه خوک

**کودی** / kûdî/: ناو. ئاڤۆک ☰ کدوحلوایی

**کودیلە** / kûdîle/: ناو. فۆکلە؛ کاکۆڵ؛ قژی فردراوی پێشەوەی سەر ☰ کُکُل

**کور**[١] / kûr/: ناو. کوێر؛ بێچاو؛ کەسێ کە چاوانی نابینن ☰ نابینا

**کور**[٢]: ئاوەڵناو. ١. کوێر؛ مجرۆ؛ بێ بینایی و سۆمای چاو ٢. قوول؛ نووق؛ ساکۆڵ ‹ئەو گۆمە کوورە، تێ نەکەوی!› ٣. دوو بەهار دیتوو (بزنی نێر) ٤. سپی و ڕەش یان دوو ڕەنگ (بزن) ☰ ١. نابینا ٢. ژرف؛ گود ٣. دو ساله (بُز نر) ۴. ابلق (بُز)

▣ **کوریا چاڤێ** قوولکەی جێ چاو ☰ کاسەی چشم

**کوران** / kûran/: ناو. ١. داری قەلاشکەری ٢. قوولایی؛ ساکۆڵی ☰ ١. هیزم جنگلی ٢. عُمق؛ گودی

**کوراندن** / kûrandin/: چاوگ. کەندن؛ کۆلین؛ قوول کردن ☰ گود کردن

**کوراهی** / kûrahî/: ☜ **کورایی**

**کورایی** / kûrayî/: ناو. کووراهی؛ قوولایی ‹کوورایی و هەوراز› ☰ ژرفا؛ عُمق

**کوربەشک** / kûrbeşik/: ناو. کورەبەشە؛ کوورموشک ☰ گورکن

**کوردانک** / kûrdanik/: ناو. کرمێکە نە سەری خویا دەکا نە کلکی ☰ نوعی کرم

**کورقۆش** / kûrqoş/: ئاوەڵناو. چکووس؛ چرووک؛ ڕژد ☰ خسیس

**کورک** / kûrik/: ناو. ١. گیرفان؛ بەریک؛ جێو ٢. مووشەدەمەی مسگەران ☰ ١. جیب ٢. از ابزار مسگری

**کورکورە** / kûrkûre/: ☜ **کۆلارە ـ١**

**کورموشک** / kûrmuşk/: ☜ **کوربەشك**

**کورنگە** / kûringe/: ناو. کـوور؛ دۆخـی سـەر بـە یەکدا کردنی پەز لـە گـەرمای هـاوین و سـێبەر دروست کردن بۆ خۆ ⊠ حالت سر درهم فرو بـردن گوسفندان از گرما

**کوورو** / kûrû/: کورک؛ مـووی نـەرمی ژێـرەوەی پەز ⊠ کُرک

**کـوورە** / kûre/: نـاو. ١. سـۆپە ٢. ☜ **کـوێرو** ٣. پلوورەهەنگی سروشتی لە چیا ٤. ☜ **کورەخانە** ٥. مووشەدەمە؛ دەمەی ئاسنگەری ‹مەگـەر مـن کوورەی ئاسنگەرانم/ هەر ساتێ ئاگر بەربەیتە گیانم؟! «فولکلۆر»› ⊠ ١. بُخاری ٢. ☜ **کوێرو** ٣. کنـدوی عسل وحشی ۴. ☜ **کورەخانە** ۵. کورەی آهنگری

⊡ **کـوورە دان**: شلـّـخە دانی هــەنگ؛ دەرهــاتنی بەرەی تازەی مێشەنگوین ⊠ بیرون آمدن نسـل جدید زنبورعسل

**کورەپەزخانە** / kûrepezxane/: ☜ **کورەخانە**

**کورەخانـە** / kûrexane/: نـاو. کـوورە؛ کۆرەخانــە؛ کوورەپەزخانە؛ کیرە؛ کڵی خشت سوور کردنـەوە ⊠ کورەی آجُرپزی

**کـوورەدەم** / kûredem/: نـاو. کەسـێ کـوورەی ئاسنگەر دەدەمێنێ ⊠ کورەدمان

**کوورەڕێ** / kûreřê/: ☜ **کوێرەڕێ**

**کوورەفەرەنگی** / kûreferengî/: ناو. ١. سـۆپەی لـە کـانزا ٢. سـۆپای نـەوتی ⊠ ١. بُخـاری فلـزی ٢. بُخاری نفتی

**کـووری** / kûrî/: نـاو. قـوولایی؛ دژی تـەنکایی و ڕاستایی ⊠ عُمق

**کوور**[١] / kûř/: ☜ **کورنگە**

**کوور**[٢]: ئاوەڵناو. ١. قوول؛ نـووق؛ سـاکۆل ٢. کـۆم؛ کووز؛ چەماو ‹لە ڕۆینە کـۆترن، لەنجـە مـراوی/ بـە بـازی هەڵـپەڕین، ئاسـکی کەفـەڵ کـوور «سـەیفولقوزات»› ٣. دژوار؛ سـەخت ‹هـەورازی کوور/ پشـتی شـاخێکی بـە عـومرە/ بـۆ پێشـمەرگە دانەویوە «شێرکۆ»› ⊠ ١. ژرف ٢. کوژ ٣. دشوارگُذر

⊡ **کـوور بـوون**: ١. تـەزین و ڕەپ بـوونی ئەنـدامی لەش بە یەک باردا ‹هێندە هەڵبەز۔دابەزیان پێم کرد تـەواو کـوور بـووم› ٢. هـەموو لـەش یـان بەشێکی بە شێوەیەکی نائاسایی ڕاگرتن ‹خۆت کوور مەکـە! جـوان ڕاوەسـتە!› ٣. کـۆم بـوون؛ چەمانەوە ⊠ ١. گرفتن عضُله ٢. بدن یا بخشی از آن را مُنقبض کردن ٣. خم شدن

• **کوور**[٣]: پاشەوشە. چەماوە ‹پشتکوور› ⊠ خمیده

**کوور**[٤]: پێرۆ. ← **کاڕ و کوڕ**

**کووڕکوورە** / kûřkûře/: ناو. ١. ☜ **کـۆلارە ـ١** ٢. بەتالایی جێگەی تۆپ و پەڕەی ئاسیاو ⊠ ١. ☜ **کۆلارە ـ١** ٢. جای پرەهای آسیا

**کـووڕەکـوور** / kûřekûř/: ئاوەڵـکار. کۆمـەکۆم و گێڕەگێڕ ⊠ با حالت خمیده

**کووری** / kûřî/: ناو. ١. قوولی ٢. کۆمی؛ چەماوەیی ٣. نوقسان؛ کەمایەسی ⊠ ١. عُمق ٢. کوژپشتی ٣. نقصان

**کـووز**[١] / kûz/: نـاو. ١. دابڕاوییـەک لـە شـتێ کـە شوێنەکەی بـۆش یـان بـە قەڵشـاوی ماوەتـەوە (وەک: قاش لە میوە) ٢. تەختەی باریـک لـە شـۆ کـردنی زەمـین ٣. دووخ؛ زۆپـی نێـوان تیخـی خەنجەر و شمشێر ٤. قەبوو؛ حەشارگەی کەو ٥. چووز؛ ڕەوتی چووزانەوەی پێست ٦. خـەتێ کـە دەکێشرێ ٧. گۆزە؛ کـووزە ٨. جۆگـەی بـاریکی بن داران کە بۆ ئـاو دان دروسـت کـراوە ٩. ☜ **کووزەڵە** ⊠ ١. بُرشی کە جایش ماندە (مانند: قاچ میـوە) ٢. قطعەی باریک شخم زدە ٣. برجستگی وسـط تیـغ خنجر و شمشیر ۴. کمین کبـک شـکاری ۵. سـوزش پوست ۶. شیار؛ خط کشـیدنی ٧. کـوزە ٨. آبـرو پـای درختان ٩. ☜ **کووزەڵە**

⊡ **کووز دان**: ١. خەت لە زەوی کێشـان بـۆ شـێو کـردنی دوایـی ٢. خـەت دان ⊠ ١. شـیار زدن

زمین با گاوآهن برای تختەسازی شخمی ٢. خط زدن

**کووز کردن:** قاش کردن ☰ قاچ کردن

**کووز لێ دان:** خەت دانی زەوی بە گاسن و تەختە ـ تەختە کردنی ☰ شیار کردن و تقسیم‌بندی زمین کشاورزی

**کووز**[٢]: ئاوەڵناو. ١. کوور؛ کۆم؛ قەمبوور؛ پشت‌چەماو ٢. قلەشاو؛ تلیشیاگ ☰ ١. کوژپشت ٢. شکافته

⊡ **کووز بوون:** داهاتنەوە؛ کۆم بوونەوە ☰ خم شدن

**کووزاندنەوە / kûzand(i)newe/:** چاوگ. چووزاندنەوە؛ سووتاندنەوە ☰ بە سوزش آوردن پوست

**کووزانەوە / kûzanewe/:** چاوگ. چووزانەوە؛ سووتیانەوە ☰ احساس سوزش کردن در پوست

**کووزر / kûzir/:** ناو. ١. ڕەوتی چووزینەوە؛ سووزیانەوە ٢. چۆنیەتی پرووزانی وەک مووی پێست و... ☰ ١. سوزش پوست ٢. سوختن موی پوست

**کووزریان / kûziryan/:** چاوگ. ١. چووزانەوە ٢. پرووزان ☰ ١. سوختن (پوست) ٢. سوختن (مو)

**کووزریک / kûz(i)rîk/:** ناو. هەناسەی بە سۆز ☰ آه سوزناک

**کووزرین / kûz(i)rîn/:** چاوگ. پرووزانی مووی پێست ☰ سوختن موی پوست

**کووزک / kûzik/:** ناو. کووپی باکێشی حەجامەت ☰ بادکش حجامت

**کووز ـ کووز**[١] **/ kûz kûz/:** ئاوەڵناو. ١. قاش ـ قاش؛ کەرت ـ کەرت ‹خەیاری کووز ـ کووز بۆ ترشی› ٢. خەت ـ خەتی زەوی بۆ شۆ کردن ☰ ١. قاچ ـ قاچ ٢. عمل خط زدن زمین برای تختەبندی

⊡ **کووز ـ کووز کردن:** ڕووشاندن؛ ڕووکاندن ☰ شیار زدن

**کووز ـ کووز**[٢]: ئاوەڵکار. قاش ـ قاش؛ کوت ـ کوت ‹خەیارەکەی کووز ـ کووز پێدام› ☰ قاچ ـ قاچ

**کووز ـ کووز**[٣]: دەنگەناو. قرووسکە و لوورەی سەگ ☰ زوزەی سگ

**کووزماڵ / kûzmał/:** ناو. جۆماڵ؛ کاری ماڵین و پاک کردنەوەی کووزی ناو باخ ☰ لایروبی جوی باغ

**کووزوو / kûzû/:** ناو. ١. گۆزە؛ کووزە؛ کووپەڵەی مل‌باریک ٢. فیزماڵک؛ کاری باریک بوونەوە و دەرچوون ☰ ١. کوزە ٢. عمل جیم شدن

**کووزە / kûze/:** ناو. ١. کووزوو؛ گۆزە ٢. جانەوەرێکە پێستی بەقیمەتە و قاتڵی مریشکانە ☰ ١. کوزە ٢. جانوری با پوست قیمتی

**کووزەڵە / kûzełe/:** ناو. کووز؛ کووزی؛ کوویز؛ کێزەکە؛ بریەمێ؛ گیایێکە خواردەمەنی، بە گەڵای سەوز و گوڵی سپی یان زەردەوە، لە ئاودا دەڕوێ، تامی توونی هەیە و بۆ دەرمانیش دەشێ ☰ ترتیزک/ شاهی آبی؛ علف چشمه

**کووزی / kûzî/:** ناو. ١. کووزوو؛ گۆزە؛ کووپەڵەی مل‌باریک ٢. ☜ **کووزەڵە** ☰ ١. کوزە ٢. ☜ **کووزەڵە**

**کووزین / kûzîn/:** چاوگ. لووراندن ☰ زوزە کشیدن

**کووژاندنەوە / kûjand(i)newe/:** ☜ **کوژاندنەوە**

**کووژانەوە / kûjanewe/:** ☜ **کوژانەوە**

**کووژگە / kûjge/:** ☜ **کەوێڵ ـ١**

**کووژە / kûje/:** ناو. ١. لووساوکی گەنم لە ئاسیاودا ٢. ئامرازێکی خوێنگرانە لە هەنبانەی دروست دەکەن ٣. کوویژە؛ کوویژک؛ گیانەوەرێکی گۆشتخۆرە لە بنەماڵەی ڕاسووەکان، لە قەراخ ئاوی شیریندا دەژی ٤. دەڵەک؛ دەڵلەک ☰ ١. گلوی آسیاب ٢. از ابزار حجامت ٣. شِنگ ۴. دله

**کووژەرە / kûjere/:** ناو. گووژە؛ عەنزەرووت؛ شیلەی تاڵی برێ دارچک و دەوەن ☰ انزروت

**کووژەکە / kûjeke/:** ناو. کوژەکە؛ کووژەکەکەرانە؛

کووژەکەرانە؛ جۆرێ مووررووی شینی قرنج ـ قرنج کە بۆ چاوزار بە کار دێت 🇮🇷 خرمُهرەی آبی رنگ

**کووژەکەرانە** / kûjekerane/: ☜ **کووژەکە**

**کووژەکەکەرانە** / kûjekekerane/: ☜ **کووژەکە**

**کووژی** / kûjî/: ناو. سووچ؛ قوژبن؛ قوڕنە 🇮🇷 گوشە؛ زاویە

**کووس** / kûs/: ناو. ١. کۆست؛ بەخت؛ تاڵە ٢. چۆرتم؛ کەڵەمە؛ کارەسات ‹کووس خاسە، کووسەڵکووس گەنە!› 🇮🇷 ١. بخت ٢. مُصیبت

**کووسک** / kûsik/: ناو. کولە؛ کللۆ؛ کلۆ؛ کوللە 🇮🇷 ملخ

**کووسە** / kûse/: ناو. ١. کدووی دۆڵمە ٢. کۆستک؛ بەندی خەنجەر ٣. جۆرێ ماسی ٤. گۆشە؛ سووچ 🇮🇷 ١. کدو ٢. بند خنجر ٣. نوعی ماهی ۴. گوشه

**کووسەڵ** / kûsel/: ☜ **کیسەڵ**

**کووسەلە** / kûsele/: ☜ **کیسەڵ**

**کووسەڵکووس** / kûsełkûs/: ناو. کۆست لە بانی کۆست 🇮🇷 مُصیبت مُضاعف

**کووسی** / kûsî/: ☜ **کیسەڵ**

**کووش**[١] / kûş/: ناو. قسەی پووچ و بێمانا 🇮🇷 یاوه

**کووش**[٢]: ئاوەڵکار. ١. هیچ؛ هۆچ (لە وەرامدا) ٢. لە کوێ؛ لە کام جێ ٣. کوا؛ کوانێ 🇮🇷 ١. هیچ ٢. کُجا ٣. کو

**کووشنای** / kûşnay/: چاوگ. تێتەقاندن؛ بە پەلە چوون 🇮🇷 با عجله رفتن

**کووفین** / kûfîn/: چاوگ. فیتوو لێ دان؛ فیقە کێشان 🇮🇷 سوت کشیدن

**کووڤ** / kûv/: ئاوەڵناو. کۆم؛ پشتچەماو 🇮🇷 کوژپشت

**کووڤی** / kûvî/: ئاوەڵناو. کێوی؛ وەحشی 🇮🇷 وحشی

**کووک**[١] / kûk/: ☜ **کەڵەشێر**

**کووک**[٢]: ئاوەڵناو. کوڤ؛ کۆم 🇮🇷 خَم

**کووکلە** / kûkle/: ناو. وەویلکە؛ بووکەڵەی زارۆکان 🇮🇷 عروسک

**کووکوو** / kûkû/: ناو. کوکوو؛ کووکی؛ خواردەمەنییەک لە تێکەڵی سەوزی، سێفەزەمینی یان سەبزی و ئارد و هێلکە کە لە ڕۆندا سووری دەکەنەوە 🇮🇷 کوکو (خوراک)

**کووکووڕەک** / kukuřek/: ناو. تاق‌تاق؛ تووتەک 🇮🇷 مُرغ حق

**کووکووکەرە** / kûkûkere/: ناو. بەتەک؛ کوڕکوڕە؛ کەت؛ وەتەک؛ قەتێ 🇮🇷 کوکر

**کووکە**[١] / kûke/: ئاوەڵناو. ١. گچکە؛ بووچکەڵە ٢. ئاژاوەچی؛ شەڕهەڵایسێن 🇮🇷 ١. کوچولو ٢. آشوبگر

**کووکە**[٢]: دەنگەناو. قووقووی کەڵەشێر 🇮🇷 صدای خروس

**کووکی** / kûkî/: ☜ **کووکوو**

**کووکین** / kûkîn/: چاوگ. کۆکین؛ کۆخین؛ قۆزین 🇮🇷 سُرفه کردن

**کوول**[١] / kûl/: ناو. ١. تەشتی نانکەران ٢. فیلی شەترنج ٣. تەویلە؛ گەوڕ؛ پشتێر ٤. زاخە؛ زاخڕ؛ تەوخ ٥. ئەشکەوت؛ شکەفت؛ مغارە؛ کاف 🇮🇷 ١. ناوەی خمیر ٢. فیل شطرنج ٣. اصطبل ۴. زاغه ۵. غار

**کوول**[٢]: ئاوەڵناو. پێڵە؛ قیچەڵپاچ؛ شەفتوور 🇮🇷 اُریب

**کوولا** / kûla/: ناو. هەیوانی لە شووڵ و قامیش 🇮🇷 کپر

**کوولک** / kûlik/: ناو. کولێن؛ کولانە مریشک 🇮🇷 لانەی ماکیان

**کوولەکە** / kûleke/: ☜ **کەدوو ـ١**

⊡ **کوولەکەترشی**: کوولەکەی شەقەباخی 🇮🇷 نوعی کدو

**کوولەکەچنار**: جۆرێک دار چناری قرچۆکە، ڕاست هەڵناچێ و شتێکی خڕ دەگرێ و نێوەکەی پڕ دەبێ لە مێشوولە 🇮🇷 نوعی چنار نامرغوب

**کوولەکەخۆرشتی:** جۆرێ کوولەکەی پێستناسکی مەیلەوسەبزە، بەقەد خەیارێک دەبێ بەڵام ئەستوورترە ▤ کدو خورشی

**کوولەکەدەروێشی:** ☜ **کوولەکەسەراوی**

**کوولەکەسەراوی:** کەدووبارزانی؛ شاقەباغی؛ شاقەپاغی؛ کوندرێ میرانی؛ کوولەکەدەروێشی؛ جۆرێ کەدووی پێستئەستووری زەرد یان نارنجی، هێندێک شیرین و ناوهڵۆلی پڕ لە تۆمی سپی و چەورە ▤ کدوحلوایی

⊡ **لە بنی کوولەکە دان:** *[کینایە]* چەپ و ڕاست هەموو شتێک درکاندن ‹لە بنی کوولەکەم داوە و هەرچی هەیە نووسیومە «هێمن»› ▤ تە چیزی را درآوردن

**لە کوولەکە باخاندا بوون:** *[پلار]* تەواو بێئاگا بوون؛ هیچ ئاگا لە شتێ نەبوون ‹کاکە ئەو کاتە ئێمە خەباتمان دەکرد، تۆ لە کوولەکەباخان بووی!› ▤ در بی‌خبری کامل بودن

**لە کوولەکەدا بانگ کردن:** *[پلار]* کەمتەرخەمی کردن لە دەنگ کردن و هەواڵ داندا ‹وا دیارە لە کوولەکەدا بانگت کردووە نەمانزانیوە!› ▤ کوتاهی کردن در خبر رساندن

**کوولەکێن** / kûlekên/: ناو. ١. چێشتی کوولەکە ٢. بازی بە کدووی هێلکەیی ▤ ١. خوراک کدو ٢. بازی با نوعی کدوی کوچک

**کوولی** / kûlî/: ناو. ١. کۆڵهەڵگر؛ حەماڵ ٢. چۆڵپەرەست ▤ ١. حمّال ٢. کولی

**کووم** / kûm/: ناو. ١. ☜ **کڵاو** ٢. *[شورەیی]* قنگ؛ قوونگ ٣. پۆپەی کەڵەباب ٤. مەلێکی بچووکە ٥. ترس؛ خۆف ▤ ١. ☜ **کڵاو** ٢. مقعد ٣. تاج خروس ۴. پرنده‌ای است کوچک ۵. ترس

**کوومزرخ** / kûmzirx/: ☜ **کڵاوخود**

**کوومزڕ** / kûmziř/: ناو. کڵاوی بێلێوارە ▤ کُلاه بی‌لبه

**کوومک** / kûmik/: ناو. ١. ☜ **کڵاو** ٢. پۆپەی کەڵەشێر ▤ ١. ☜ **کلاو** ٢. تاج خروس

**کوون** / kûn/: ناو. *[شوورەیی]* ١. قوون؛ قن؛ قنگ؛ کن؛ کونگ؛ کنگ ٢. کەفەڵ؛ کەماخ؛ سوورین؛ زۆپی ژێر ناوقەد و ژووری ڕان ▤ ١. مقعد ٢. باسن

**کوونە** / kûne/: ناو. کوانوو؛ ئاگردان؛ تفک ▤ اُجاق

**کوونی** / kûnî/: ناو. *[ناشیرین]* قوونەدەر؛ خوزگ؛ بەپشت؛ خوزەچەک؛ نێری گاندەر ▤ کونی

**کوونێر** / kûnêr/: ناو. قوونێر؛ دومەڵی لای قنگ ▤ دُمل مجاور مقعد

**کووه** / kûh/: ناو. پیرۆ؛ پێروو؛ کۆئەستێرەی پەروین ▤ ستارەی پروین

**کووی** / kûy/: ناو. کونی بیور و تەشوێ ▤ سوراخ تبر و تیشه

**کوویای** / kûyay/: چاوگ. کوتران؛ کوتیان ▤ کوبیدن

**کوویایەن** / kûyayen/: ئاوەڵناو. کوویایەنە؛ بە عەرزدا کەوتوو ▤ زمین‌خورده

**کوویایەنە** / kûyayene/: ☜ **کوویایەن**

**کوویت** / kûyt/: ناو. نەخۆشی قۆڕی ▤ فتق

**کوویڕ** / kûyř/: ئاوەڵناو. قووڵ ▤ ژرف؛ عمیق

**کوویڕی**[1] / kûyřî/: ناو. قووڵی؛ نووقی ▤ ژرفی

**کوویڕی**[2]: ئاوەڵناو. بە دەر لە دیتنی چاو ▤ خارج از دید

**کوویز** / kûyz/: ☜ **کووزەڵە**

**کوویژرک** / kûyjirk/: ناو. کاژێر؛ قوژبن؛ سووچ؛ قولینچک ▤ گوشە؛ زاویە

**کوویشک** / kûyşik/: ناو. ١. هەپە؛ کەرکیت؛ شەی پۆ کوتان ٢. کووژە؛ دەڵەک ▤ ١. شانەی پودکوبی در بافندگی ٢. دله

**کوویک** / kûyk/: ناو. دارکوتکە؛ دارتەقێنە ▤ دارکوب

**کوویل** / kûyl/: ناو. تەوخ؛ کویل؛ کوول؛ زاخە؛

هۆڵەمەڕ لە نێو زەمیندا زاغه

**کوین** / kûyn/: ناو./شوورەیی/ قوون؛ قنگ مقعد

**کویی** / kûyî/: ئاوەڵناو. ١. کێوی؛ کێفی؛ پێوەندیدار یان سەر بە کێو و چیاوە ٢./کینایە/ دەشتەکی؛ کێفیلە؛ بێوەری لە ژیار و فەرهەنگ ١. کوهی ٢. وحشی

**کە**[1] / ke/: ئاوەڵناو. دیکە؛ دن؛ تر؛ تەر؛ هەژی: ١. جیاواز لەگەڵ ئەمە ‹کاری کە› ٢. زۆرتر لەوە ‹ڕۆژیکی کەم ماوە› ١و٢. دیگر

**کە**[2]: ئامراز. ١. ئەگەر ‹گورگ کە پیر بوو، دەبێتە گەپجاڕی سەگ!› ٢. کاتێ؛ هەر دەمێ ‹کە تۆ هاتی، من دێم؛ که من مردم...› ٣. بۆ لێکگرێ دان و پێک بەستنەوەی ڕستە ‹کارێ کە تۆ کردت بە کەسی تر ناکرێ› ٤. تا؛ بۆ ئەوەی ‹هەڵسا کە هەوسارەکە بگرێ› ٥. ئەی؛ بۆ پێداگری کردن ‹کە جوانە!؛ کە تۆ وتت وەرە، هاتم› ٦. ئیدی ‹ئیسە کە چووە، چیتر باسی مەکەن!› ٧. کە وایە؛ ئێستاکە ١. که ٢. هنگامی که ٣و٤. که ۵. وه؛ چه ۶ که ۷. پس؛ حالا که

**ـ کە**[3]: پاشەوشە. ـ کەر ‹خلێنکە› ـ کن؛ کننده

**ـ کە**[4]: پاشگر. ١. ـ گە؛ ـ گا؛ چێ ‹زەلکە› ٢. ـ ک؛ ـۆڵە؛ چکۆلە ‹کچکە؛ ملوانکە› ٣. ـ ک؛ بە دوای ڕەگی کارەوە ناوێک دروست دەکا ‹بڕکە› ١. ـ گاه ٢. ـک ٣. پسوند اسم‌ساز

**کە**[5]: پاشبەند. ١. /سووکەڵە/ ـەکە؛ بۆ بناس کردنی ناو و وابەستەی تاک ‹گەلاکەی خوارد؛ مانگاکە ماوە؟؛ دایکە تەنیاکەی بەجێ هێشت› ٢. بۆ دواندن یان لێ‌وتنی ناسراو ‹هۆ پیاکە!؛ ئای دیکە گیان!› ١و٢. نشانەی معرفه

**کەباب** / kebab/: ناو. کەواو؛ کواو؛ خواردەمەنییەک، بەتایبەت گۆشت، کە لە سەر ئاور یان کانزای داخ برژاوە کباب

**کەبابچی** / kebabçî/: ناو. کەواوچی؛ کەواوی؛ کەواوکەر؛ گۆشتبرێژ؛ کەسێ کە کاری کەباب برژاندنە کبابچی

**کەبابخانە** / kebabxane/: ناو. کەبابفرۆشی؛ کەبابی؛ دووکانی برژاندن و فرۆشتنی کەباب کبابی

**کەبابفرۆشی** / kebabf(i)roşî/: ☜ کەبابخانە

**کەبابکراو** / kebabk(i)raw/: ئاوەڵناو. برژاو؛ کەبابی کبابی

**کەبابە** / kebabe/: ناو. ١. بەری دارێکە بە قەد دەنگە ئیسۆت، بۆ دەرمان دەبێ ٢. واڕۆک ١. کبابەی دارویی ٢. جوجەی بهاره

**کەبابەچینی** / kebabeçînî/: ناو. کەبابەی دەرمان کبابەچینی

**کەبابی**[1] / kebabî/: ناو. کەواوی: ١. کەبابچی؛ کەواوچی؛ گۆشتبرێژ؛ کەسێ کە کاری دروست کردنی کەبابە ‹کابرای کەبابی باشی نەبرژاندووە› ٢. کەبابخانە؛ کەبابفرۆشی ‹نیوەڕۆ چووین بۆ کەبابی› ١و٢. کبابی

**کەبابی**[2]: ئاوەڵناو. کەواوی: ١. بە ڕەنگی کەباب (بۆ ترێ دەڵێن) ‹ترێ کەبابی› ٢. شیاو بۆ کەباب ‹گۆشتی کەبابی› ٣. برژاو؛ کەبابکراو ‹بیباری کەبابی› ١. به رنگ کباب ٢. کبابی ٣. کبابی

**کەبات** / kebat/: ناو. کەوات؛ بەری دارێکە لە جنسی نارنج شینی ئاماڵ زەردی قونجرـ قونجرە بۆ چێشت دەبێ نوعی نارنج

**کەبادە** / kebade/: ناو. دارێکی بە زنجیرەوە کە لە زۆرخانەدا بە کار دێنن کبّاده

**کەبار** / kebar/: ناو. ١. نۆبەر؛ نۆبەرە؛ خیفە ٢. سەرەتای هەر شتێ ٣. سەلای بەرەبەیان ١. نوبر ٢. سراغاز ٣. مناجات سحری

**کەبارە** / kebare/: ناو. دەسپێک؛ سەرەتا: ١. بەشی یەکەمی هەر شتێ ٢. هەوەڵین قۆناغی هەر کارێ ١و٢. سرآغاز؛ آغاز

**کەبان / keban/**: ☜ **کابان**

**کەبانو / kebanû/**: ☜ **کابان**

**کەبانی / kebanî/**: ☜ **کابان**

**کەبانیتی / kebanîtî/**: ☜ **کابانی**

**کەبر / kebr/**: ناو. کەبەر؛ دارێکی دڕکاوییە، بەرەکەی لە خەردەل دەکا ☰ درختی است

**کەبس / kebs/**: ناو. ١. کاری ژێر خاک کردنی لکێ بۆ ڕەگ داکوتان ٢. چەرمەسەرێ؛ سەخڵەتی؛ گێرەوکێشە ☰ ١. نوعی کاشت ٢. رنج و مشقت

**کەبک / kebk/**: ☜ **کەو**

**کەبلەمە / kebleme/**: ☜ **کەپلەمە**

**کەبۆت / kebot/**: ناو. دارێکی سەختی جەنگەڵییە ☰ درختی جنگلی

**کەبۆتەر / keboter/**: ☜ **کۆتر**[1]

**کەبۆتەرڤان / kebotervan/**: ☜ **کۆترباز**

**کەبو / kebû/**: ناو. باویلکە؛ بایلکە ☰ قاصدک

**کەبوتک / kebûtik/**: ☜ **کۆتر**

**کەبوتەر / kebûter/**: ☜ **کۆتر**[1]

**کەبەر / keber/**: ناو. ١. ☜ **کەبر** ٢. مارچێوە؛ گیاماران؛ شەفەلە ☰ ١. ☜ **کەبر** ٢. مارچوبە

**کەبەند / kebend/**: ناو. ١. کەتەن؛ پەتی درێژی سەربەئاڵقە بۆ گرتنی حەیوانی ڕەوەک ٢. پشتێن؛ کەمەربەن؛ قەدبەند ☰ ١. کمند ٢. کمربند

⊡ **کەبەند کێشان**: تەناف کێشان ☰ کمند کشیدن

**کەبیسە / kebîse/**: ناو. کبیسە؛ ساڵێ کە ٣٦٦ ڕۆژە ☰ کبیسە

**کەپ[1] / kep/**: ناو. ١. ☜ **کەپۆ** ٢. ناومشت؛ بەری دەست ٣. پووکاوڵە؛ چەمبۆڵە ٤. فیز؛ دەعیە ٥. دوند؛ ترۆپک؛ بانترین شوێنی چیا ☰ ١. ☜ **کەپۆ** ٢. کف دست ٣. ام ٤. تکبر ٥. قُلەی کوە

⊡ **کەپ لێ گرتن**: چەمبۆڵە لێنان؛ پووکاوڵە لێنان ☰ ام کردن؛ پنجە گذاشتن

**کەپ[2]**: ئاوەڵناو. کەل؛ بێددان ☰ بی‌دندان

**کەپتار / keptar/**: ناو. بناری پڕ لە داری چیا ☰ دامنەی پُردرخت کوە

**کەپتان / keptan/**: ☜ **کاپیتان**

**کەپچە / kepçe/**: ☜ **کەوچیز**

**کەپر / kep(i)r/**: ناو. کەپەر؛ خانووچکەی لە شوول و قامیش ‹باران دایدا و ژیان لە کەپراندا زەحمەت ببوو؛ پەنامان بە گوندان برد «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ کَپَر؛ کازە

⊡ **کەپر بەستن**: کەپر کردن؛ خانووچکەی لە شوول و قامیش کردنەوە ☰ کَپَر ساختن

**کەپر کردن**: ☜ **کەپر بەستن**

**کەپرسەوز / kep(i)rsewz/**: ئاوەڵناو. *[کینایە، پلار]* وازوازی؛ تاوتاوی؛ هەردەم لە سەر خەیاڵێک ☰ دمدمی

**کەپرۆک / keprok/**: ناو. کەپرۆکە: ١. کەپری پچووک ٢. *[مەجاز]* دنیا؛ دونیا؛ دنێ ☰ ١. کپر کوچک ٢. دنیا

**کەپرۆکە / keproke/**: ناو. ١. ☜ **کەپرۆک** ٢. دارەڕای کەپری تەواو سەرنەگیراو ٣. ☜ **کەڕو** ٤. پترۆ؛ پەترۆکی سەر برین ☰ ١. ☜ **کەپرۆک** ٢. داربست ٣. ☜ **کەڕو** ٤. خشک‌ریشە

⊡ **کەپرۆکە بەستن**: ١. توێژاڵکە پەیدا بوون لە سەر ترشاو ٢. پترۆ بەستنی برین ☰ ١. کفک زدن ٢. خشک‌ریشە بستن زخم

**کەپرە / kepre/**: ناو. ١. پەترۆکەی سەر برین ٢. ڕیخی بەر پێدراوی توندی وشک و ڕەق ٣. تەختایی سەر کێو ☰ ١. خشک‌ریشەی روی زخم ٢. سرگین پامال‌شدەی خشک ٣. زمین مسطح بالای کوە

**کەپرسەوزە / kepresewze/**: ☜ **کەپرەشینە**

**کەپرشین / kepreşîn/**: ☜ **کەپرەشینە**

**کەپرشینە / kepreşîne/**: ناو. کەپرەسەوزە؛

کەپرەشـــین: ١. کەپرەشـــینەی جوولەکـــە؛ جێژنێکی جوولەکە ٢. ڕێژنەبارانی زۆرتر، ئێوارانی هـاوین ☰ ١. از اعیـاد یهـود ٢. رگبـار عصـرهنگام تابستانی

▣ **کەپرەشینەی جوولەکە:** ☜ **کەپرەشینە ـ١**

**کەپسۆک** / kepsok/: ناو. سیخوڕ؛ سووچەڕ؛ سیچڕ ☰ تشی؛ گربەتیغی

**کەپسوول** / kepsûl/: نـاو. ١. دەفـری گرۆڤـەر و زۆرتـر کـانزایی ‹کەپسوولـی گـاز› ٢. جۆرێـک دەرمان بە شێوەی پۆشەنێکی ژیلاتینی کە ماکی دەرمانی تێ دەکرێ ☰ ١و٢. کپسول

**کەپسوون** / kepsûn/: ناو. چەشنی؛ تەرەقە ☰ ترقه

**کەپک** / kepik/: ناو. ١. ☜ **کەپکە** ٢. ☜ **کەو ـ١**

**کەپکـە** / kepke/: نـاو. کـــەپک؛ دەرپـــەڕیوی جیانەبووەوە لە هەر شتێ ☰ دماغه

**کەپلەمە** / kepleme/: ناو. کەبلەمە؛ کەفلەمـە: ١. کەپەنە؛ دەرمانی هاڕدراو کە دەکرێتە دەمەوە ٢. *[شـوورەیی؛ کینایـە]* مشـتە؛ مشـتاو؛ دەسـپەڕ ☰ ١. کفلمه ٢. استمناء

▣ **کەپلەمە کردن:** دەرمان یان خۆراکێکی هـاڕدراو (وەک: قاوت و ئاردەتوو) کردنە لـەپی دەسـت و هەڵخستنی ☰ کفلمه کردن

**کەپلەمە کێشان:** دەسـپەڕ کـردن ☰ جلـق زدن؛ استمناء کردن

**کەپلەمـەکێش** / keplemekêş/: نـاو. *[شـوورەیی]* کەسێ کە بە دەست خۆ ڕەحەت دەکا ☰ جلقزن

**کـەپن**[١] / kepn/: ئاوەڵـناو. بـێددان؛ دەمبـەتاڵ ☰ بیدندان

**کەپن**[٢]: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی کەسێ کە بـە هـۆی نەبوونە ددان لە دەمیـدا، کـاتی خـواردن و قسـە کـردن، کەپـە ـ کـەپی دێ ☰ ویژگـی شـخص بیدندان هنگام خوردن و سخن گفتن

**کەپنای** / kepnay/: چاوگ. کەپەکەپ کردن؛ بـێ ددان ئاخافتن و خواردن ☰ بی دندان سخن گفـتن و خوردن

**کـەپنایۆ** / kepnayo/: چـاوگ. کەپەکـــەپ لـــێ هەڵسان ☰ سخن گفتن و خوردن بی دندان

**کەپوســـەلەیمـــانی** / kepuseleymanî/: نـــاو. پەپووسێمانە ☰ هُدهُد

**کەپۆ** / kepo/: ناو. کـاپۆ؛ کـەپ؛ کـەپۆل؛ کـەپوو؛ کەپووگە؛ کەپۆلک؛ کەپووی؛ کەپی؛ لووت؛ بێڤل؛ دفن؛ دم ☰ بینی

**کەپۆبـەرانی** / kepoberanî/: نـاو. پووزبـــەران؛ بەرانپۆز؛ قەپۆزبەران ☰ بینی عُقابی

**کەپۆپان** / kepopan/: ئاوەڵناو. فلچ؛ لـووتپـان ☰ بینیپهن

**کـەپۆرە** / kepore/: نـاو. ١. ئـاپۆرە؛ حەشـامات ٢. دەنگەدەنگ و زەنا ـ زەنا ☰ ١. شلوغی جمعیـت ٢. همهمه و جنجال

**کەپـۆزل** / kepozil/: ئاوەڵـناو. لووتـە؛ لـووتزل ☰ دماغ گُنده

**کـەپـۆزەلام** / kepozelam/: ئاوەڵـناو. لـووتزل ☰ دماغ گُنده

**کەپۆکـەرە** / kepokere/: نـاو. باڵـندەیەکە کاتـێ دەخوێنــێ دەنگێکـی وای لـێ دێ: «کـەپۆ... کەپۆ... » ☰ پرندەای است

**کەپۆل** / kepol/: ☜ **کەپۆ**

**کـەپۆڵ** / kepoł/: نـاو. کەپۆڵـــک: ١. ناوشــان؛ قەلانـدۆش؛ قۆڵـنج ٢. سـەر ☰ ١. میـان کتـف؛ قلمدوش ٢. سر

**کەپۆڵک** / kepołik/: نـاو. ١. ☜ **کـەپـۆ** ٢. ☜ **کەپۆڵ**

**کەپوو**[١] / kepû/: ناو. ١. قەحەف؛ قـاف؛ قاپێلکـەی سەر ٢. لووت؛ کەپۆ ٣. کەپ؛ پووکاوڵە؛ چەمبۆڵە ٤. ددانی پێشین ٥. پەپووسلێمانە ٦. کوند؛ بـوو ☰ ١. جُمجُمه ٢. بینی ٣. ام؛ عمل پنجه گذاشـتن ۴.

دندان پیشین ٥. هُدهُد ٦. جُغد

▣ **کەپوو خوێندن:** *[کینایە]* پەپوو خوێنـدن؛ چـۆڵ و هۆڵ بوون ☰ پرنده پر نزدن؛ خلوت بودن

**کەپوو**[٢]: ئاوەڵناو. کەپن؛ بێددان (پیر) ☰ بی‌دندان

**کەپور / kepûr/**: نـاو. چەشنێ ماسی خـۆراکی ☰ کپور

**کەپوکـەرە / kepûkere/**: نـاو. پەپووســێمانە ☰ هُدهُد

**کەپوگە / kepûge/**: ☜ **کەپۆ**

**کەپول / kepûl/**: نـاو. کاپۆڵ؛ کەللە؛ کەلە؛ کلـۆخ؛ کەلێ؛ لە ئەستۆ بەرەو ژوور ☰ کلەی سر

**کەپولە / kepûle/**: ناو. ١. ☜ **کاپولە** ٢. کـەپوو؛ قاپیلکە سەر ☰ ١. ☜ **کاپولە** ٢. جُمجُمە

**کەپـون / kepûn/**: نـاو. دەمەلاسـکە؛ لاسـایی ☰ عمل ادای کسی را در آوردن

**کەپـونی / kepûnî/**: نـاو. لاسـاکەر؛ کەسـێ کـە دەمەلاسکەی خەڵک دەکاتەوە ☰ کسی کـە ادای دیگران را در می‌آورد

**کەپوی / kepûy/**: ☜ **کەپۆ**

**کەپویلە / kepûyle/**: ☜ **کاپولە**

**کەپەر**[١] **/ keper/**: ☜ **کەپر**

**کەپـەر**[٢]: ئاوەڵـناو. کلـۆز؛ کولـۆس؛ تایبەتمەنـدی کەسێ کە ددانی پێشوی نییە ☰ ویژگی کسی کە دندان‌های جلویی را ندارد

**کەپەز / kepez/**: ناو. هەر چیایـەک تـەختایی لـە سەرەوەی هەبێ ☰ کـوهی کـە قلـەی آن مسـطح است

**کەپـەزە / kepeze/**: ئاوەڵـناو. *[پـلار]* ڕەزاگـــران؛ خوێنتاڵ ☰ گرانجان

**کەپـەک / kepek/**: نـاو. کەلپـەک: ١. تێکولـــی دانەوێڵەی لە دەسـتاڕکراو ٢. کرپـک؛ درشـتەی ئاردی دابێژراو ☰ ١. پوستەی دانەی آشی ٢. نُخالە

**کەپەکەپ / kepekep/**: دەنگەناو. دەنگی خواردن و ئاخافتنی بێددان ☰ صدای خوردن و سخن گفـتن بی دندان

**کەپەلـەک / kepelek/**: ناو. گیابڕ؛ کرمێکە بە گیاوە دەنیشێ پەز بیخوا پێ دەمرێ ☰ کرمی کشـندەی گوسفندان

**کەپەلـەکی / kepelekî/**: ئاوەڵـناو. گیابـــڕخواردوو (پەز) ☰ مُبتلا بە بیماری کرمی (گوسفند)

**کەپـەن / kepen/**: نـاو. ١. کفـن؛ کەفـەن ٢. ☜ **کەپەنەك ـ١** ☰ ١. کفن ٢. ☜ **کەپەنەك ـ١**

**کەپەناشی / kepenaşî/**: ناو. بـەربووک؛ پێخەسـوو ☰ ینگە

**کەپەنک / kepenik/**: ☜ **کەپەنەك ـ١**

**کەپەنکە / kepenke/**: ناو. گەنم یا جۆ کە تازە دێ گوڵ بکا ☰ گندم یا جو در شُرُف خوشە زدن

**کەپەنە / kepene/**: ناو. ١. ☜ **کەپەنـەك ــ١** ٢. ☜ **کەپلەمە ـ١**

**کەپەنەک / kepenek/**: ناو. ١. کەپـەن؛ کەپـەنک؛ کەپەنە؛ فـەرەنجی ٢. ☜ **کـەپـەنـەکداڵ** ☰ ١. بالاپوش نمدی ٢. ☜ **کەپەنەکداڵ**

**کەپەنـەکداڵ / kepenekdał/**: نـاو. کەپەنـــەک؛ سیسارگ ☰ کرکس

**کەپی / kepî/**: ☜ **کەپۆ**

▣ **کەپی پان:** *[پلار]* بێقل فەتسـی؛ کـەپۆ پـان ☰ بینی پهن

**کەپی‌پان / kepîpan/**: ناو. جۆرێ هـەنار ☰ نـوعی انار

**کەپێ / kepê/**: ئاوەڵکار. کەپێک؛ مشتێ؛ مشتێک؛ پڕی یەک دەست ☰ پُر یک کف دست

**کەپێک / kepêk/**: ☜ **کەپێ**

**کـەت**[١] **/ ket/**: نـاو. ١. تـەختی داریـنی لـە سـەر نووستن و دانیشتن ٢. دەفری قووڵ و دەمواڵا بۆ جێگەی ئاردی نانەوا ٣. وێنجـە؛ گیایـەکی سـێ پەڕەی بەپنجـە، خۆشـترین ئالـفە بـۆ حـەیوانی

گیاخۆر ٤. چارۆکە؛ چارەگە ٥. لای سەرووی قۆڵ ٦. کەرت؛ پاژ؛ پارچە ٧. چاودێری؛ چاڤێری ٨. کارەسات؛ ڕووداوی ناخۆش ٩. کورکورە ▦ ١. تخت چوبین ٢. ظرف آرد نانوا ٣. یونجە ۴. سردوش زنانە ۵. قسمت بالای آستین ۶. قطعە ۷. مُراقبت ۸. رویداد ناگوار ۹. کوکر

▣ **کەتا بنی:** بەرداشی ژێروو ▦ سنگ زیرین آسیا

**کەتا سەری:** بەرداشی سەروو ▦ سنگ بالایی آسیا

**کەت**[٢]: ئاوەڵناو. ١. تاک؛ تەنیا ٢. زل؛ زەلام ٣. لێوکەت؛ حەفلچ ٤. لێوارەشکاو ٥. کەل؛ نوقسان؛ سەقەت؛ شکاو؛ پەڕیو ‹حەیوانی کەت› ▦ ١. تک ٢. گندە ٣. لبشکری ۴. لبپر ۵. ناقص؛ معلول

**کەتارە** / ketare/: ناو. قەمە؛ قەدارە ▦ قمە؛ قدّارە

**کەتان**[١] / ketan/: چاوگ. پسان؛ قەتان؛ قرتان ▦ قطع شدن

**کەتان**[٢]: ناو. کەتەن: ١. هەلاوە؛ لۆکەکێوی؛ گیامێروول؛ گیامرۆژە؛ گیای ئالیکی یەکساڵان و بێپرز، بە گەڵای سەوزی باریک و درێژ و نووک‌تیژ، گوڵی ئاوی درشت و لقی ڕیشاڵ ـــ ڕیشاڵی نەرم و بڵندەوە ٢. پارچە یان بەنی دروستکراو لە ڕیشاڵ و هەودای ئەو گیایە ▦ ١. گیاه کتان ٢. پارچەی کتانی

**کەتاندن** / ketandin/: چاوگ. پساندن؛ قەتاندن؛ قرتانن ▦ قطع کردن

**کەتان و کەوان** / ketan û kewan/: ناو. کوللە؛ قوماشی سپی دەوری تەختی نووستن بۆ بەرگری لە پێشکە ▦ پشەبند

**کەتانی**[١] / ketanî/: ناو. ١. جلکی لە کەتان ٢. بادامی کاغەزی ▦ ١. لباس از کتان ٢. بادام‌کاغذی

**کەتانی**[٢]: ئاوەڵناو. پێوەندیدار یان سەر بە کەتان ‹کراسی کەتانی› ▦ کتانی

**کەتایی** / ketayî/: ناو. کەلایی؛ کەوتوویی؛ پەڕیوی ▦ لبشکستگی

**کەتبەسە** / ketbese/: ئاوەڵکار. قۆڵبەست؛ قۆڵبەس؛ باڵبەس؛ قۆڵ‌بەستە؛ قۆڵبەست‌کراو ▦ کت‌بستە

**کەترە**[١] / ketre/: ناو. ١. عەیب و عار ٢. فڕ؛ زەم؛ جنێوی زۆرتر بە شیعر ▦ ١. عیب ٢. هجو

**کەترە**[٢]: ئاوەڵناو. ١. لەکارکەوتوو ٢. سست و گوێ‌نەدەر بە کار ▦ ١. ازکار افتادە ٢. لاقید

**کەترەخانە** / ketrexane/: ناو. تەمەڵخانە؛ جێگەی بەخێو کردنی مرۆی لەکارکەوتوو ▦ نواخانە

**کەترەخەم** / ketrexem/: ☜ **کەمتەرخەم**

**کەترەخەمی** / ketrexemî/: ☜ **کەمتەرخەمی**

**کەترەیی** / ketreyî/: ناو. ١. کەترە؛ کاری گوێ بە کار نەدان ٢. قسەی بێ‌مانای بێ‌ئامانج ٣. لەکارکەوتوویی ‹پیری و کەترەیی› ▦ ١. لاقیدی ٢. یاوە ٣. ازکارافتادگی

**کەتری** / ketrî/: ☜ **کتری**

**کەتک** / ketik/: ناو. ١. هەژیری ناو مەشکەڕەقە ٢. ☜ **کتك** ▦ ١. انجیر خشک در خیگ ٢. ☜ **کتك**

**کەتکەتە** / ketkete/: ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. ١. یەکە ـ یەکە؛ دانە ـ دانە ٢. پارچە ـ پارچە؛ کوت ـ کوت ▦ ١. یکی ـ یکی ٢. قطعە ـ قطعە

**کەتلە** / ketle/: ناو. زەمبیلەی لە پووش ▦ زنبیل حصیری

**کەتلی** / ketlî/: ☜ **کتری**

**کەتن** / ketin/: چاوگ. ١. کەوتن؛ بە زەمیندا بەر بوونەوە ٢. پەڕین؛ سوار بوونی نێر لە مێ ٣. پەنا بردن؛ وە دەغیل بوون ▦ ١. اُفتادن ٢. پریدن نر بر مادە ٣. پناە بردن

**کەتن** / ketn/: ناو. ١. سووکایەتی ‹ئەو مەسخەرەی

زەمانە بە شاھ و وەزیری کرد/ ئەو کەتنە قەت مەلێ بە گەدا و فەقیری کرد «مەحوی»› ۲. کاری خراپ ۳. ئاژاوە ٤. فریو ≡ ۱. اهانت ۲. کار زشت ۳. آشوب ۴. فریب

▣ **کەتن پێ کردن**: ۱. خاپاندن؛ فریو دان ۲. سووکایەتی بە سەر هێنان ≡ ۱. فریب دادن ۲. اهانت کردن

**کەتن کردن**: کاری زۆر خراپ کردن ‹کۆستت کەوێ وەک مەمت لە من کرد/ چی دیت دەوێ کەتنی خۆت بە من کرد «هەژار، *مەم و زین*»› ≡ کار زشت کردن

**کەتن گێڕان**: ئاژاوە نانەوە ‹خەریک بوون کەتنێ بگێڕن؛ ئێمەش کەتنی خۆن پێ کردن، بێ ئەوە هەستی پێ بکەن «هەژار، *قورئان*»› ≡ آشوب برپا کردن

**کەتن‌گێڕ** / ket(i)ngêř/: ئاوەڵناو. ئاژاوەچی ≡ آشوبگر

**کەتو** / ketw/: ناو. قەمتەرە؛ ئاوبارە؛ گەردان ≡ آبگردان

**کەتوان** / ketwan/: ناو. چاوێر؛ چاودێر ≡ مُراقب

**کەتوانە** / ketwane/: ناو. کەتوانی؛ چاوەدێری ≡ مُراقبت

**کەتوانی** / ketwanî/: ☜ **کەتوانە**

**کەتوجووت** / ket û cût/: ناو/ ئاوەڵکار. تاک و جووت؛ تاق و جفت ≡ فرد و زوج

**کەتوجووتانێ** / ket û cûtanê/: ناو. تاق‌وجفت؛ کایەی تاقمانەجووت ≡ بازی تک یا جفت

**کەتوکڵفت** / ket û k(i)łft/: ئاوەڵناو. زەبەلاح؛ تەژە ≡ کت‌وکُلفت

**کەتوەر** / ketwer/: ئاوەڵناو. تەمەڵ و بێکارە ≡ تنبل و بیکارە

**کەتوەری** / ketwerî/: ناو. تەمەڵی؛ بێکارەیی؛ خوێرییەتی ≡ تنبلی؛ بیکارگی

**کەتۆ** / keto/: ئاوەڵناو. بێ‌هاوتا؛ تاقانە ≡ بی‌همتا؛ یگانە

**کەتوو** / ketû/: ناو. ۱. کردوو؛ بێڵێ کە بە دوو کەس دەیکێشن لە تەختە ـ تەختە کردنی زەوی ۲. تەختە زەمین بۆ چاندن ≡ ۱. بیل دونفرەی کرت‌سازی ۲. کرت کشاورزی

**کەتوون** / ketûn/: ناو. کەتەن؛ کەبەند ≡ کمند

**کەتە**[1] / kete/: ناو. ۱. دەفری ئاردی نانەوا ۲. قبوولی؛ قوبلی برنج ۳. بۆ جاری دووهەم چنینی پەلکی تووتن ≡ ۱. ظرف آرد نانوا ۲. دمُپخت؛ کتە ۳. عمل چیدن دوبارەی برگ توتون

**کەتە**[2]: ئاوەڵناو. ۱. لێوکەت؛ حەفلەچ ۲. زەبەلاح ‹... بە سەرکردەیی ژمارەیەکی کەم لە ئەفسەرانی کۆنەپەرست و دەرکراوی ئەرتەش و دەستەیەک پیاوخراپ و کەتە و کۆشە و ... «هێمن»› ۳. لاکەت (دەفر) ٤. شاخ‌شکاو ≡ ۱. لب‌شکری ۲. لندهور ۳. لب‌شکستە ۴. شاخ‌شکستە

**کەتەپڵاو** / ketep(i)ław/: ناو. قوبلی؛ قبوولی ≡ دمُپخت؛ کتە

**کەتەن**[1] / keten/: ناو. ۱. کەتوون؛ کەبەند ۲. ☜ کەتان[2] ≡ ۱. کمند ۲. ☜ **کەتان**[2]

**کەتەن**[2]: ئاوەڵناو. ۱. دەست‌بەستراوی بێ‌دەسەلات ۲. تایبەت دراو بە کارێ. هەروەها: **کەتەن بوون** ≡ ۱. دست‌بستەی درماندە ۲. مأمور

**کەتەو** / ketew/: ناو. قفەی ولاخی بەرز ≡ سُرفەی چهارپایان

**کەتەوکۆشە** / kete w koşe/: ئاوەڵناو. زەبەلاحی هیچ‌وپووچ ≡ لندهور بیکارە

**کەتەوڵ** / ketewił/: ناو. قەشقە؛ گیایەکە لە نێو گەنمدا شین دەبێ، گوڵەکەی سپی و دانەکەی وەک نووسەکە وایە، بەلام درووەکەی ئەستوورە ≡ گیاهی خاردار

**کەتی**[1] / ketî/: ناو. ۱. کەمایەسی؛ کەمایەتی ۲.

قەڵشـاوی لێـوار ٣. زەدە؛ خـەش؛ خـەوش ٤. مڤرۆیی؛ مەمەندامی ٥. نێوان تێکەوتنی لێو ٦. تاقانەیی؛ بێوێنەیی ٧. قەتێ؛ کوڕکوڕ ☰ ١. نقصان ٢. عیب ٣. معلولیت ۴. شکستگی لبه ۵. شکافتگی لب ۶. یگانگی؛ بی‌همتایی ٧. مرغ سنگخواره؛ باقرقره

**کەتی**[2]: ئاوەڵناو. ١. پەککەوتوو؛ لەکارکەوتوو ٢. مایەپووچ؛ بابردە؛ نابووت ٣. ☜ **کەوتو**[1] ☰ ١. از کار افتاده ٢. ورشکسته ٣. ☜ **کەوتو**[1]

**کەتیبە** / ketîbe/: ناو. ١. سەردەرانەی بە خشتی سوور ٢. نووسراوی زۆر قەدیم لە سەر بەرد ٣. دەستەیەک لە لەشکر ☰ ١. سردر آجری ٢. کتیبه ٣. گروهی از سپاه

**کەتیر**[1] / ketîr/: ناو. داری بن شەغرە کە دەکەوێتە سەر پشتی بارەبەر ☰ چوب زیر بار گیاه

**کەتیر**[2]: ئاوەڵناو. بزر؛ نوقم؛ لە بەر چاو ون ‹وا هەلات کەتیر بوو› ☰ ناپدید

**کەتیرا** / ketîra/: ☜ **کەتیره**

**کەتیره** / ketîre/: ناو. کەتیرا؛ کترە؛ جەباری؛ شیلەی زەردەگوێنی؛ جەوی ساقەتەی تاقمێ گەون کە لە کۆتایی بەهاردا بە خۆیەوە یان بە لەلە دان دێتە دەرەوە و وشک دەبێتەوە، بۆ دەرمان دەشێ و لە پیشەسازیدا بە کار دەچێ، هەروەها ژیلی سەری لێ دروست دەکەن ☰ کتیرا

**کەتیرەلێدراو** / ketîrelêd(i)raw/: ئاوەڵناو. شۆدار؛ دەقدراو ☰ آهارزده

**کەتیفە** / ketîfe/: ناو. پاسارە؛ گوێسوانە؛ سوانە؛ لێوارەی بان ☰ لبەی بام

**کەتیکانێ** / ketîkanê/: ناو. قەمچان؛ گەمەیەکە بە پێنج بەرد دەکرێ ☰ یەقُل‌دوقُل

**کەتێ** / ketê/: ☜ **کوڕکوڕ**

**کەج**[1] / kec/: ☜ **کج**

**کەج**[2]: ئاوەڵناو. خوار؛ چەوت؛ خێچ ☰ کج

**کەجان** / kecan/: سارستە. وشەی دواندنی کچ بە خۆشەویستی ☰ دخترجان

**کەجە** / kece/: ئاوەڵناو. کەدە؛ بیانی؛ بێگانە؛ ناس‌نەکری ☰ ناشناس؛ بیگانه

**کەجەر** / kecer/: ناو. قەرەچ؛ قەرەچی ☰ کولی

**کەجێز** / kecêz/: ☜ **کەوجز**

**کەچ**[1] / keç/: ☜ **کچ**

▣ **کەچا چاڤ**: گلێنەی چاو؛ بیبیلەی چاو ☰ مردُمک چشم

**کەچ**[2]: ئاوەڵناو. ١. چەفت؛ خوار؛ لار ٢. لێوکەت؛ حەفلچ ٣. لێوارەکەت ☰ ١. کج ٢. لب‌شکری ٣. لب‌شکسته

▣ **کەچ حەلی**: ☜ **کچ هلی**

**کەچانی** / keçanî/: ئاوەڵناو. ١. کچانە؛ کەنیشکانە ٢. *[پلار]* کچانی؛ تایبەتمەندی کوڕێ کە ئاکاری ژنانەیە ☰ ١. دخترانه ٢. ویژگی پسری با رفتار دخترانه

**کەچایی** / keçayî/: ناو. ١. چەفتی؛ گێڕی ٢. نارێکی؛ خواری ☰ ١. کجی ٢. ناهمواری

**کەچخولق** / keçxulq/: ئاوەڵناو. کەچخوڵک: ١. ناوچاوتاڵ؛ ڕووگرژ ٢. نەگونجاو؛ ئاکارخراپ ☰ ١. اخمو ٢. بداخلاق

**کەچخوڵک** / keçxułk/: ☜ **کەچخولق**

**کەچک** / keçik/: ☜ **کەوچك**

**کەچکانی** / keçkanî/: ناو. ١. کەنیشکی؛ کچێنی؛ دۆخ و چۆنیەتی کچ بوون ٢. بن؛ تۆژاڵێکی ناسک لە شەرمی کچدا ☰ ١. دوشیزگی ٢. پردەی بکارت

▣ **کەچکانی برن**: کچێنی نەهێشتن ☰ برداشتن بکارت

**کەچکە** / keçke/: ناو. ئامرازێکی بەننایانە ☰ از ابزار بنایی

**کەچکەقوڵە** / keçkequłe/: ناو. کەمچەقوڵە؛

کەوچکەقولـە؛ بەچکـەبۆقی هێشـتا لـە پێسـتی ساوایی دەرنەهاتوو ☰ کفچلیزک؛ نوزاد قورباغه

**کەچولە** / keçule/: ناو. ژارماسی ☰ گیاه زهرماهی

**کەچونە** / keçûne/: ناو. کوچکاور؛ بەردی ئاگردان ☰ سنگ أُجاق

**کەچە**[1] / keçe/: ناو. ١. تەحت؛ ڕایەخ لـە بـەرگنی پەستواو ٢. فەرەنجی بێ‌قـۆڵ ☰ ١. کپنـک؛ نمـد زیرانداز ٢. بالاپوش نمدی بی‌آستین

**کەچە**[2]: ئاوەڵناو. ١. شاخ‌شکاو ٢. سـەقەت؛ ناتـەواو ☰ ١. شاخ‌شکسته ٢. ناقص

**کەچە ـ**[3]: پێشوشـە. ١. زۆر دەکـارکراو و بـێ‌نـرخ ‹کەچەکـەوش؛ کەچەبـەڕە؛ کەچـەکلاو› ٢. کـەت؛ پـەڕیو؛ کـەل ‹کەچەشـاخ؛ کەچـەدەوری› ☰ ١. مُستعمل ٢. کَل

**کەچەتڕێن** / keçet(i)řên/: ئاوەڵناو. *[پلار، شـوورەیی]* کەچەوەتڕێن؛ ڕووشکاو؛ بە شەرماخراو ‹جـوابێکم دایەوە کەچەتڕێنم کرد!› ☰ از رو رفته؛ شرمنده شده

◻ **کەچـەتڕێن کـردن:** *[پـلار، شـوورەیی]* شـەرمەزار کردن؛ خەجالەت کردن ☰ از رو بُردن

**کەچـەچی** / keçeçî/: نـاو. کەسـێ کـە بـەرگن دەپسـتێوێ و دەیکاتـە تـەحت و فـەرەنجی ☰ نمدمال

**کەچەر** / keçer/: ئاوەڵناو. ١. کەچەڵ؛ سەربرین ٢. تووک لە سەر وەریو ☰ ١. کچل؛ کَل ٢. سرطاس

**کەچـەڕی** / keçeřî/: نـاو. ١. کەچەڵـی؛ نەخۆشـی سەر برینداری ٢. سەر بـێ‌تـووکی ☰ ١. کچلـی؛ کَلی ٢. طاسی

**کەچەشـاخ** / keçşax/: ئاوەڵـناو. شـاخ‌شـکاو؛ تایبەتمەندی شاخدارێ کە شـاخێکی شـکابێ ☰ شاخ شکسته

**کـەچـەشیر** / keçeşîr/: نـاو. کالوومـە؛ شمشـێری خراپ و بێ‌قیمەت ☰ شمشیر نامرغوب

**کـەچـەلـۆک** / keçelok/: نـاو. سیسـارگ؛ سیسارکەچەڵە ☰ کرکس

**کەچەلە** / keçele/: ئاوەڵناو. کەچەڵ (ژن) ☰ کچل (زن)

**کەچەلەک**[1] / keçelek/: نـاو. ١. کـوڕەکەچەڵـەی قارەمانی چیرۆکان ٢. باڵـدارێکی لاشـەخۆرە لـە خەرتـەڵ دەکـا ☰ ١. پسـرک کچـل افسـانەهـای کودکان ٢. از انواع لاشخور

**کەچەلەک**[2]: ئاوەڵناو. کەمێک کەچەڵبوو ☰ انـدکی کچل

**کەچەلەی** / keçeley/: ☜ **کەچەڵی**

**کەچەڵ** / keçeł/: ئاوەڵـناو. کەچـەر؛ کەلـەش: ١. گـەڕ؛ کـەل؛ تووشـیاری نەخۆشـی کەچەڵـی ‹کەچـەڵ لـە سـەری ئەترسـێ و کـوێر لـە چـاوی «مەسـەل»› ٢. *[پلار]* تـاس؛ هـەوێر؛ حـۆت؛ بـێ قژەسەر ☰ ١. کَل؛ کچل ٢. سرطاس

◻ **کەچەڵی خواشوکور:** ئەو کەچەڵەی هـەر تەوقـە سەری کەچەڵـە و مـووی لاجانـگ و کاکۆڵـی هەیە ☰ کسی که فقط وسط سرش کچل است

**کەچەڵی گشتەکی:** ئەوکەسەی خـەتێکی ناسـک مووی ماوە، لە بن کلاوە دەری‌دەخـا ☰ کسـی که فقط خطی دور سرش مو دارد

**کەچەڵی گەرگەڕی:** ☜ **کەچەڵوگوڕی**

**کەچەڵوگوڕی** / keçeł u guřî/: ئاوەڵـناو. کەچەڵـی گەرگەڕی؛ کەچەڵی تەواو کەچەڵ و بە کـرێژ ☰ کاملاً کچل

**کەچەڵۆک** / keçełok/: ناو. ١. چێشتێکە لە سـاوار و نیسک چێ دەبێ ٢. سیسارگە کەچەڵـە ☰ ١. آشی از بلغور و عدس ٢. کرکس

**کەچەڵە** / keçełe/: نـاو. جووچکـە باڵـندەیێ کـە تووکـە مـردارەی وەرانـدووە و تـازە تـووکی لـێ دیتەوە ☰ جوجەی کُرک ریختەی تازە پر

**کەچـەڵـی** / keçeřî/: نـاو. گـەڕی؛ کەچەڵـەی؛ نەخۆشی کەچەڵی ☰ کچلی

**کەچەوەترێن** / keçewet(i)rên/: ☜ **کەچەترین**

**کەچی** / keçî/: ناو. ١. خواری؛ چەوتی ٢. ☜ **کەوچك** ☰ ١. کجی ٢. ☜ **کەوچك**

**کە چی** / ke çî/: ئامراز. ١. دەگەڵ ئەوەشدا «بە سەروم وت کە: ڕاست و سەرکەش و بەرزی! کە چی لەرزی/ کە فەرقیشم بگاتە ئاسمان، بەندەی قەدی یارم «نالی»» ٢. ئەو پەڕی؛ مەبەست؛ دەی «ئەم قسەت کرد، کە چی؟» ☰ ١. با این وصف؛ با وجود این ٢. که چه

**کەچیچ** / keçîç/: ناو. ١. چینە؛ ڕەوتی دان هەڵگرتنەوەی مەل ٢. جێگەی چینە کردنی باڵندەی ماڵی ☰ ١. چینه ٢. جای چینه کردن مُرغ

**کەچیلۆک** / keçîlok/: ناو. کچۆلە؛ کیژی بیچکەلانە ☰ دختر کوچولو

**کەچین** / keçîn/: ئاوەڵناو. کچ؛ مێوینەی مێردنەکردوو ☰ شوهرنکرده

**کەچینی** / keçînî/: ناو. کچێنی؛ خوێنی نیشانەی کچ بوون ☰ خون بکارت

**کەحلان** / keĥlan/: ☜ **کەهێل**

**کەحێل** / keĥêl/: ☜ **کەهێل**

**کەخس** / kexs/: ناو. کخس؛ خزکە؛ خسکە؛ خیسکە؛ ساقەتەی خڕ و کورتی ژێرزەوینی برێک ڕووەک ☰ پیاز

**کەد** / ked/: ناو. ١. کوتە؛ تیکە ٢. کاتە؛ بەهرەی زەمین ٣. زەحمەت؛ مەینەت؛ دەردیسەر ☰ ١. قطعه؛ تکه ٢. بهره‌ی زمین ٣. رنج و زحمت

**کەدن** / kedin/: ☜ **کادێن**

**کەدو** / kedû/: ناو. ١. کدوو؛ کودوو؛ کودی؛ کولند؛ کولندر؛ کولندەر؛ کولەند؛ کولەندەر؛ کولیندک؛ کوندر؛ کوندک؛ کوو؛ کوولەکە؛ کوی؛ کووی؛ کولند؛ قولند؛ قەباخ؛ کوندڕ؛ کریتی؛ قوندک؛ گیای ئالیکی بە چەن جۆری جیاواز، ساقەتەی خزۆک و بەری درشتەوە کە بە کوڵاوی یان سوورەوەکراوی دەخورێت ٢. ☜ **کادێن ـ١** ☰ ١. کدو ٢. ☜ **کادێن ـ١**

**کەدون** / kedûn/: ناو. کەدووینک؛ کەدینک؛ جەڕەی ئاو ☰ سبوی کوچک

**کەدوینک** / kedûynik/: ☜ **کەدون**

**کەدە**[1] / kede/: ناو. کوڕی چکۆڵە ☰ پسربچه

**کەدە**[2]: ئاوەڵناو. کەجە؛ نەناسیاو؛ بێگانە؛ غەوارە ☰ ناشناس

**کەدەر** / keder/: ناو. کەسەر؛ مەینەت؛ خەم ☰ غم؛ اندوه

**کەدەو** / kedew/: ناو. نەخۆشییەکی ماڵاتە، لە سەرمان تووش دەبن ☰ از بیماری‌های دامی

**کەدی** / kedî/: ئاوەڵناو. کەدی؛ دەستەمۆ؛ ڕام؛ فێربووی ماڵ ☰ اهلی؛ رام شده

**کەدینک** / kedînik/: ناو. ١. ☜ **کەدون** ٢. کووپەڵە ☰ ١. ☜ **کەدون** ٢. خُمچه

**کەدینگ** / kedînig/: ناو. کلووسک؛ بستووگە؛ کووپەڵە ☰ خُمچه؛ خُم کوچک

**کەدێنە** / kedêne/: ناو. شەربەی سواڵەت ☰ لیوان سُفالین

**کەر**[1] / ker/: ناو. ١. هەر؛ خەر؛ کەهر؛ ولاخ؛ گوێدرێژ؛ گوێرێژ؛ گۆهدرێژ؛ بەنەری؛ گیانەوەرێکی گوهانداری چوارپێی کەوی، لە تیرەی ئەسپان، بە سەری زل، گوێی درێژ و کلکی کورتەوە کە لە هەر پادا یەک ئەنگوست و یەک سمی هەیە، باری پێ دەبەن و سواری دەبن ٢. *[کنایه]* ساویلکە؛ سایلۆح؛ سەرسەری و بێ ئاوەز ٣. لەت؛ نیوەی جیا ٤. پارچە؛ پاژ ٥. کەرکە؛ کەری؛ کۆمەڵی دابڕاو لە گەلە ٦. قەر؛ قەرد؛ وام؛ واو ٧. گامێش؛ جووتی مانگامێش ٨. کەڵ؛ کەل؛ جۆرێ حەیوانی چیا ٩. دیوی تەفی جگ ١٠. هەدا؛ ئۆقرە ☰ ١. خر؛ الاغ ٢. نفهم ٣. شقه؛ نیمه ۴. قطعه؛ پاره ۵. جمع جدا شده از گله ۶. وام ۷. گاومیش نر ۸.

کل کوهی ۹. یکی از جهات قاپ ۱۰. آرام و قرار
**کەران باب گاو:** *[ناشیرین]* جوێنێکە ☚ دشنامی است

**کەر کوڵ و بار سوک:** *[کینایە]* ۱. فەقیری ئاسوودە ۲. مسافری بارسووک ☚ ۱. ندار آسودەدل ۲. مسافر سبکبار

**کەر بون:** *[مەجاز]* ۱. پێ داگرتن لە سەر کار و قسەی بێبایەخ ۲. توورە بوونی بێئاقلانە ۳. کڵاو سەر چوون؛ فریوخواردن ☚ ۱. لجاجت کردن ۲و۳. خر شدن

**کەر بە کۆپان دان:** ڕۆن هێنان و ئاو بردن؛ مامەڵەی بە ڕواڵەت باش بەڵام بە زەرەر کردن ☚ خر دادن و خُرما گرفتن

**کەر پێ ناو نەدران:** *[پلار]* زۆر نەفام بوون ☚ بسیار ابله بودن

**کەر کردن:** کەر کرن: ۱. لەت کردن ۲. *[مەجاز]* فریودان؛ خەڵەتاندن ☚ ۱. پارە کردن ۲. فریب دادن

**کەر کرن:** ۱. ☜ **کەر کردن** ۲. قەرز کردن؛ وام وەرگرتن ☚ ۱. ☜ **کەر کردن** ۲. وام گرفتن

**کەر نیان لە باوکی کەسێ:** *[ناشیرین]* جنێوێکی پیسە ‹هەی کەر بنێم لە باوکی بۆ ماڵی!› ☚ دشنامی است

**کەر هاتن:** ۱. کەر بوون ۲. چەقینی جگ؛ تەف هاتن ☚ ۱. خر شدن؛ لجاجت کردن ۲. ایستادن قاپ

**کەری خۆ بەستنەوە:** *[کینایە]* بەرد نانە سەر مەڵۆی خۆ؛ باری خۆ نانە بارخانەوە؛ کاروباری خۆ دابین کردن و واز لە هەموو شتی تر هێنان ☚ خر خود را از پُل گذراندن

**کەر[۲]:** ناوەڵناو. ۱. ☜ **کەڕ ـ۱** ۲. *[پلار]* زەلام؛ قەبە ۳. چەماو؛ خوارەوەبوو ☚ ۱. ☜ **کەڕ ـ۱** ۲. گُندە؛ بزرگ ۳. خمیده

**کەر ـ[۳]:** پێشوشە. ۱. قەبە؛ زل ‹کەرمێش؛ کەرمۆز› ۲. *[پلار]* زۆر؛ فرە ‹کەرخۆر؛ کەرزۆر› ☚ ۱. خر ـ ۲. بسیار

**ـ کەر[۴]:** پاشەوشە. ۱. پێکهێنەر؛ جێبەجێ کەر ‹کارکەر› ۲. لە جنسی کەر ‹کوڕکەر› ☚ ۱. ـ کن؛ ـ گر؛ کنندە ۲. ـ خر

**کەرئاوی / ker'awî/:** ناو. پلیکان؛ کەڵک؛ چەڵک ☚ پلیکان؛ مُرغ سقّا

**کەرا / kera/:** ناو. ۱. ڕشک؛ مێتووکە؛ گەرای ئەسپێ ۲. بەرد؛ کوچک؛ تەوەن ☚ ۱. رشک ۲. سنگ

**کەراخ / kerax/:** ناو. ۱. قەراخ؛ ڕەخ ۲. میراو؛ کەسێ کە بە سەر بەش کردنی ئاو ڕادەگا ☚ ۱. کنار ۲. میراب

**کەراس / keras/:** ☜ **کراس ـ۱**

**کەراڤی / keravî/:** ☜ **کەڵك ـ۳**

**کەراک / kerak/:** ناو. کەراکە؛ هەوێردە ☚ بلدرچین

**کەراکە / kerake/:** ☜ **کەراك**

**کەرامات / keramat/:** ناو. کەرامەت: ۱. کاری عاجباتی کەسانی تایبەتی نوقم بوو لە عیرفاندا ۲. *[مەجاز]* کاری سەی و سەمەرەو نەگونجاو ☚ ۱. کرامات اولیا ۲. کارهای عجیب و غریب

**کەرامەت / keramet/:** ناو. ۱. ☜ **کەرامات** ۲. ڕەوتی بووژانەوەی گیا و گوڵ و شینکە ☚ ۱. ☜ **کەرامات** ۲. فرایند دوبارە جان گرفتن گُل و گیاه

**کەرانبەر / keranber/:** ناو. قانگەلاشک؛ وشکە کەنگری بابردەڵە ☚ کنگر خشک بادبردە

**کەراندش / kerandiş/:** چاوگ. ۱. ڕاکێشان بە زەویدا ۲. کێشان بە تەرازوو ☚ ۱. بر زمین دراز کشیدن ۲. وزن کردن

**کەرانشین / keran(i)şîn/:** ☜ **کرانشین**

**کەرانە[۱] / kerane/:** ناو. *[پلار]* ۱. مامەڵەپەشیمانی؛ پارە یان شتێک کە لایەنی پەشیمان لە سەودا،

بەو لایەنەکەی ئەدا کە مامەڵەکە هەڵبوەشێتەوە ٢. پیتاک؛ خاوە؛ پارە یان شتێ کە بە ناڕەوا لە کەسێک بستێنرێ ٣. باجێ کە دەسەلات بەرانبەر بە هەر بارەبەرێ، لە خاوەنەکەی دەستێنێ ٤. پارەیێ کە بە بێ هۆ باخت بکرێ ☗ ١. پول پشیمانی از معامله ٢. باج سبیل ٣. باج سرانەی باربران ۴. پول ولخرجی شده

**کەرانە**[٢]: ئاوەڵناو. ١. *[پلار]* وەک کەر ‹سەرەی کەرانە› ٢. پێوەندیدار یان سەر بە کەر ‹کۆپانی کەرانە› ٣. کەرەکی؛ گەوجانە و نالەبار؛ نەگونجاو ‹شۆخی کەرانە؛ قسەی کەرانە› ☗ ١. خرمانند ٢. مرتبط با الاغ ٣. خرکی

**کەرانە**[٣]: ئاوەڵکار. *[پلار]* هەر وەک کەر ‹کەرانە هاتە بەرەوە و هەرای لێ کرد› ☗ خرکی

**کەراو / keraw/**: ناو. بارە؛ فایدە؛ قازانج ☗ فایده

**کەراوات / kerawat/**: ☜ **کراوات**

**کەراوی / kerawî/**: ☜ **کەڵك ـ٣**

**کەرایەتی / kerayetî/**: ☜ **کەریەتی**

**کەرب / kerb/**: ناو. ١. کەرەب؛ خەم؛ خەفەت ‹دنیا هەمی بوویە ئێش و عوشرەت/ زالا فەلەکێ ژ کەرب و حەسرەت «خانی»› ٢. ☜ **کەربا** ☗ ١. اندوه ٢. ☜ **کەربا**

**کەربا / kerba/**: ناو. کەرب؛ کەربایەی؛ کەربایی؛ کەروا؛ کەروایی؛ کەڤرا؛ بێزوو؛ بێزی؛ بێزگ؛ مەگیرانی ☗ ویار

**کەرباب / kerbab/**: ناو. کەرباڤ؛ کەرباوک؛ جنێوێکە بابی بەرجنێو دەگرێتەوە ☗ فُحش بە معنی پدرسوخته

**کەربازاڕ / kerbazař/**: ناو. *[پلار]* حۆریاتبازاڕ؛ کۆڕی جلفان ☗ جمع هرزگان

**کەرباڤ / kerbav/**: ☜ **کەرباب**

**کەرباندن / kerbandin/**: چاوگ. ١. بێزوو کردن ٢. کەربین؛ هان دان ☗ ١. ویار کردن ٢. تشجیع کردن

**کەرباوک / kerbawk/**: ☜ **کەرباب**

**کەربایەی / kerbayey/**: ☜ **کەربا**

**کەربایی / kerbatî/**: ☜ **کەربا**

**کەربوکین / kerb û kîn/**: ☜ **کسپوکۆ**

**کەربون / kerbawk/**: ناو. کاربون؛ توخمی کیمیاوی ناکانزا، بە ژمارەی ئەتومی ٦ و کێشی ئەتومی ١٢،٠١١، کە لە چەند بیچمی جۆراوجۆردا (وەک: ئەڵماس، گرافیت، خەڵووز و دوودە) پەیدا دەبێ و توخمی سەرەکی هەموو گیا و گیانەوەرێکە ☗ کربُن

▣ **کەربونهیدرات:** پێکهاتەیەک لە کەربون، ئوکسیژن، هیدرۆژن (وەک: شەکر، نیشاستە و...) ☗ کربوهیدرات

**هیدرۆکەربون:** پێکهاتەیەک لە کەربون و هیدرۆژن ☗ هیدروکربُن

**کەربۆکی / kerbokî/**: ئاوەڵناو. کەربۆنەکی؛ هەمیشە دژ و خەمبار ☗ همواره اندوهگین

**کەربۆنەکی / kerbonekî/**: ☜ **کەربۆکی**

**کەربەتین / kerbetîn/**: ناو. گازی بزمار کێشانەوە ☗ انبر میخکِش

**کەربەش / kerbeş/**: ناو. دڕکێکە کەر حەزی لێ دەکا ☗ خاربنی است

**کەربین / kerbîn/**: ☜ **کەرباندن ـ٢**

**کەرپاڵ / kerpal/**: ئاوەڵناو. قەرپاڵ؛ جلکقەتیای؛ شڕ و شڕۆڵ ☗ ژندەپوش

**کەرپنج / kerpinc/**: ناو. جۆرێک بۆژانەی گوڵگەورەیە ☗ نوعی گیاه بومادران

**کەرپووچ / kerpûç/**: ناو. کارپووچ؛ کارپیچ؛ کولپیچ؛ کەرپیچ؛ خشت؛ کەلپیک؛ کولپیک؛ خشت بوشیای؛ خشتی لم و ڕەڵمی سوورەوەکراو ☗ آجر؛ خشت

**کەرپە / kerpe/**: ناو. سەد؛ بەربەندی ئاو؛ بەندی

ئاو ☰ سد

**کەرپەزە** / kerpeze/: ناو. کەرپەسە؛ خەمەگرۆ؛ قمقمۆکە؛ سەرمازەلە؛ جۆرێ مارمیلکەی درێژە، ڕەنگ دەگۆڕێ ☰ چلپاسە؛ نوعی مارمولک

**کەرپەسە** / kerpese/: ☜ **کەرپەزە**

**کەرپیچ** / kerpîç/: ☜ **کەرپوچ**

**کەرت**[1] / kert/: ناو. کەرتک؛ کەرتل؛ کارت؛ کەر: ١. دوو پارچە ٢. پارچە؛ کوت ٣. چارەگ؛ لە چوار پاژ پاژێک ٤. بڕێ لە مێگەل ٥. تەختە زەوی ☰ ١. نصف؛ دونیم ٢. پارە؛ قطعە ٣. چارک؛ یک چهارم ۴. قسمتی از گلە ۵. کرد از زمین

▣ **کەرتی تایبەتی**: بەشێک لە ئابووری کە لە قازانجی کەس یان کەسانێکی تایبەتدایە و دەولەت بەڕێوەی نابات ☰ بخش خصوصی

**کەرتی دەولەتی**: بەشێک لە ئابووری کە لە بەردەستی دەسەلاتدایە و دەولەت بەڕێوەی دەبات ☰ بخش دولتی

**کەرت**[2]: ئاوەلناو. کەرتک؛ کەرتل؛ کارت؛ کەر: ١. لەت؛ شەق ٢. لێپەڕیو (تیخ و دەمەی تەور و...) ☰ ١. پارە ٢. لبپریدە

▣ **کەرت بون**: لەت بوون ☰ پارە شدن

**کەرتال** / kertal/: ناو. گیایەکی بەدڕکە و لە کەنگر دەکا ☰ گیاهی شبیه کنگر

**کەرتاندن** / kertandin/: ☜ **کرتاندن**

**کەرتاو** / kertaw/: ناو. شەقەجۆگە؛ ئاوێکی زۆر کە لە چۆم جیا دەکرێتەوە ☰ جوی بزرگ

**کەرتڕ** / kertiř/: ئاوەلناو. *[پلار]* چەنەبازی قسە بێتام ☰ وراج یاوەگو

**کەرتڕێنە**[1] / kert(i)řêne/: ناو. *[کنایە]* دوامین خولی کایەی گۆرەوابازی ☰ آخرین دور جوراب‌بازی

**کەرتڕێنە**[2]: ئاوەلناو. *[کنایە]* کەروەستەک؛ زۆر ڕژد (سەر بەرەوژوور) ☰ سخت (سربالایی)

**کەرتک** / kertik/: ☜ **کەرت**

**کەرتکە** / kert(i)ke-/ ـ: پێشوشە. دەسەیەکی کەم؛ چەند دانەیەک ‹کەرتکەمەڕ› ☰ گروە کوچک

**کەرتکەمەڕ** / kert(i)kemeř/: ☜ **کەرتە**

**کەرتکین** / kert(i)kîn/: چاوگ. پەڕینی لێوارە (تیخ و...) ☰ لبپر شدن (تیغ و...)

**کەرتل** / kertil/: ☜ **کەرت**

**کەرتلاندن** / kert(i)landin/: چاوگ. لەتوکوت کردن؛ پارچە ـ پارچە کردن ☰ قطعە ـ قطعە کردن

**کەرتوف** / kertov/: ناو. سێفزەمینە؛ سێفەزەوینە ☰ سیب‌زمینی

**کەرتۆپە** / kertope/: ☜ **کارتۆڵ**

**کەرتوڤل** / kertovil/: ناو. سێفزەمینە؛ سێفەزەوینە ☰ سیب‌زمینی

**کەرتۆل** / kertol/: ☜ **کارتۆڵ**

**کەرتو** / kertû/: ☜ **کردو**[1]**ـ١**

**کەرتە** / kerte/: ناو. کەرتکەمەڕ؛ دەستە پەزێک پێکەوە ☰ چند گوسفند با هم

**کەرتەپەز** / kertepez/: ناو. کەرک؛ بەشێ لە مێگەل ☰ قسمتی از گلە

**کەرتەڕ** / kerteř/: ناو. بەری گیایەکە لە خەیار دەچێ بەلام زۆر تالە ☰ نوعی خیار کوهی تلخ

**کەرتەشی** / kerteşî/: ناو. کەرگەتەشی؛ کیسۆبزنە؛ گیایەکی بەدڕکی سەرخڕە ☰ **گیاهی خاردار و توپی**

**کەرتەک** / kertek/: ئاوەلکار. ١. **زۆر؛ گەلێک ٢.** کوتێک؛ لەتێک؛ پارچەیەک ☰ ١. **بسیاری ٢. یک** قطعە؛ قطعەای

**کەرتەل** / kertel/: ناو. بەشێکی زۆر لە هەر شتێ ☰ قسمت اعظم از هرچیز

**کەرتەلەڕ** / kerteleř/: ئاوەلناو. کز و بێهێز (یەکسم) ☰ لاغرمُردنی (ستور)

**کەرتەوڵ** / kertewił/: ناو. گیایەکی بەرزەبالایە لە گۆگەم ئەکا ☰ گیاهی شبیە جوجم

**کەرتێنە** / kertêne/: ناو. داوی جاڵجاڵووکە ☰ تار عنکبوت

**کەرجە** / kerce/: ☜ **کەرژە**

**کەرچل** / kerçil/: ئاوەڵناو. کەرچلی؛ تێکەڵاو؛ تێکدراو ☰ آمیخته

**کەرچلان** / kerç(i)lan/: چاوگ. کەرچلین؛ تێکەڵ/ ئاوێتە بوون ☰ قاطی شدن؛ سرشتن

**کەرچلاندن** / kerç(i)landin/: چاوگ. تێکەڵدان؛ تێکدان؛ لێکدان؛ تێکەڵ/ ئاوێتە کردن ☰ قاطی کردن؛ سرشتن

**کەرچلی** / kerç(i)lî/: ☜ **کەرچل**

**کەرچلین** / kerç(i)lîn/: ☜ **کەرچلان**

**کەرچۆڤە** / kerçove/: ئاوەڵناو. شەڕانی؛ شەڕفرۆش؛ نەگونجاو ☰ ستیزەجو

**کەرچەک** / kerçek/: ئاوەڵناو. خوار و خێچ و دڕاو (پێڵاو) ☰ زهواردررفته (کفش)

**کەرچیچەک** / kerçîçek/: ناو. جۆرێ داری جەنگەڵییە ☰ از درختان جنگلی

**کەرخ**[1] / kerx/: ناو. ١. دۆخی دەنگ نووسان؛ دەنگ کەتن ٢. سنوور؛ کەوشەن ٣. جێ دروێنەی پاڵە لە ڕۆژێکدا ٤. دەفری سواڵەتی قەوزە لێنیشتوو ٥. شوێن؛ شوێن ٦. بێزاری؛ چۆنیەتی لە بەر چاو کەوتن ٧. ئالی؛ لا ٨. کەڵەک؛ کەڵەس؛ چەپەری سەرکوندە بۆ پەڕینەوە لە ئاو ☰ ١. صداگرفتگی ٢. مرز ٣. حجم درویدەی یک دروگر در روز ۴. ظرف سُفالین خزه گرفته ۵. رد؛ اثر ۶. بیزاری ۷. طرف؛ نزد ۸. کلک

⊡ **کەرخ بوون** ١. دەنگ گیران/ کەتن ٢. جاڕز/ بێزار بوون ☰ ١. صدا گرفتن ٢. بیزار شدن

**کەرخ**[2]: ئاوەڵناو. تەزیو؛ سڕ ☰ کرخت

⊡ **کەرخ بوون** تەزین؛ سڕ بوون ☰ کرخیدن

**کەرخاندن** / kerxandin/: چاوگ. گنخاندن؛ گەناندن؛ خراپ و گەند کردن ☰ فاسد کردن

**کەرخانە** / kerxane/: ناو. ١. کانی بەرد لێهەڵکەندن ٢. چاڵەبەفر ٣. *[کینایە]* جوننەخانە ☰ ١. معدن سنگ ٢. برفانبار ٣. فاحشەخانە

**کەرخانەچی** / kerxaneçî/: ناو. *[کینایە، ناشیرین]* دەویت؛ گەواد؛ قورمساخ ☰ دیّوس

**کەرخنکێنە** / kerxinkêne/: ناو. کەردڕ؛ کەرکوژ؛ کەرکوژە؛ گیایەکە ☰ خرزهره

**کەرخول** / kerxul/: ناو. شێلاقە؛ کەرخۆل؛ جۆرێ مزرەقی بێتمتمەیە بە قامچی لێ دان دەسووڕێ ☰ نوعی گردنا

**کەرخومر** / kerx(i)wer/: ☜ **کەرخۆر**

**کەرخوێن** / kerx(i)wên/: ئاوەڵناو. *[پلار]* زۆرخوێنی کەمبەهرە. هەروەها: **کەرخوێنی** ☰ خرخوان

**کەرخۆر**[1] / kerxor/: ناو. شانەکوورە؛ کەرخوەر؛ داڵەکەرخۆرە ☰ دال

**کەرخۆر**[2]: ئاوەڵناو. *[پلار]* کەرخوەر؛ چڵەک؛ نەوسن؛ چڵێس ☰ شکمو

**کەرخۆل** / kerxol/: ☜ **کەرخول**

**کەرخوو** / kerxû/: ناو. قەرغوو؛ جۆرە قامیشێکە، بلووری لێ چێ دەکەن ☰ نوعی نی ضخیم

**کەرخەپ** / kerxep/: ئاوەڵناو. ڕزیو لە بەر کۆنی ☰ پوسیده از کُهنگی

**کەرخەڕێ** / kerxeřê/: ناو. تووڵەڕێ؛ باریکەڕێ؛ بزنەڕێ؛ کوێرەڕێ ☰ کورەراه

**کەرخەس** / kerxes/: ناو. کاری هیچ و پووچ و بێفایدە ☰ کار بیهوده

**کەرخەسپال** / kerxespal/: ئاوەڵناو. لەکارکەوتە؛ بەکارنەهاتوو ☰ ازکارافتاده

**کەرخەسێن** / kerxesên/: ناو. *[پلار]* کەسێ کە کاری هیچ و پووچ دەکا ☰ کسی کە کارهای بیهوده می‌کند

**کەرخەک** / kerxek/: ئاوەڵناو. بە سەر یەکدا کۆماکراو ☰ بر هم انباشته؛ تلنبار شده

**کەرخەنیق** / kerxenîq/: ناو. زافەرانی کێوی؛ پیفۆک ☰ زعفران کوهی

**کەرخیت** / kerxît/: ☜ **کارتیخ**

**کەرخین** / kerxîn/: چاوگ. ١. گەنخین؛ خراپ بوون ٢. لە بەر چاو کەوتن؛ بێز لێکردنەوە ☰ ١. فاسد شدن ٢. از چشم اُفتادن

**کەرد** / kerd/: ناو. تەختە زەوی بۆ چاندن ☰ کرت کشاورزی

**کەردار** / kerdar/: ناو. چاروێدار؛ خەربەندە ☰ چاروادار

**کەردڕ**[١] / kerdiř/: ☜ **کەرخنکێنە**

**کەردڕ**[٢]: ئاوەڵناو. *[پلار]* کەرخۆر؛ چڵێس ‹دە لە کەرێکیش بپرسن: گورگی دیوە کەردڕ نەبێ؟! «پەشێو»› ☰ شکمو

**کەردڕە** / kerd(i)ře/: ناو. دەیمیلە؛ دێمیلە؛ جۆرێ هەرزنی درشت ☰ نوعی ارزن درشت

**کەردز** / kerdiz/: ئاوەڵناو. *[پلار]* گەندز؛ سیرمەخۆر؛ لادز؛ شرەخۆر؛ دەڵەدز؛ کەفەن‌دز؛ هۆگر و خووگرتووی دزینی شتی بێ‌نرخ ‹تۆ شێخی حیلەسازی، قوماربازی، کەردزی! «مەسەل»› ☰ دلەدُزد

**کەردڵ** / kerdił/: ئاوەڵناو. *[پلار]* دڵکەر؛ بێ‌خەم ☰ خردل

**کەردو** / kerdû/: ناو. ١. کەرد؛ تەختە زەوی ٢. کردووی دێراو هەڵدان ٣. گیای کاردو ☰ ١. کرت کشاورزی ٢. گراز کشاورزی ٣. گیاهی است

**کەردوکێش** / kerdûkêş/: ☜ **کردوکێش**

**کەردە** / kerde/: ناو. کردە؛ کردەوە ☰ عمل؛ فعل

**کەردەرەی** / kerderey/: چاوگ. داکردن ☰ ریختن

**کەردەنەی** / kerdeney/: چاوگ. لە بەر کردن ☰ پوشیدن

**کەردەی** / kerdey/: چاوگ. کردن ☰ کردن

**کەردەیرە** / kerdeyre/: چاوگ. داکردن ☰ ریختن

**کەردەیوە** / kerdeywe/: چاوگ. کردنەوە ☰ باز کردن

**کەردەیۆ** / kerdeyo/: چاوگ. کردنەوە ☰ باز کردن

**کەردیکل** / kerdîkil/: ناو. ئاگرخۆرە؛ شترمر؛ وشترمر ☰ شترمرغ

**کەرزک** / kerzik/: ناو. ١. ☜ **کەرژە** ٢. *[مەجاز]* مرۆی زۆر درۆزن ☰ ١. ☜ **کەرژە** ٢. آدم بسیار دروغگو

**کەرزەر** / kerzer/: ناو. سوورەقانگ؛ سوورەمراوی ☰ آنقوت

**کەرزین** / kerzîn/: چاوگ. ١. قەرسین؛ لە سەرمان ناڕەحەت بوون ٢. **بوونە بەستەڵەک** ☰ ١. لرزیدن از سرما ٢. **یخبندان شدن**

**کەرژاڵ** / kerjal/: ناو. کاری زۆر گران ☰ **کار بسیار** دشوار

**کەرژنگ** / kerjing/: ☜ **قرژانگ**

**کەرژە** / kerje/: ناو. کەرجە؛ کەرزک؛ گەنە؛ مێروویەکی بۆرە بە مالاتەوە دەنووسێ ☰ کنه

**کەرستە** / keriste/: ناو. کەرسە؛ کەرەستە؛ کەرەسە؛ کەلەستە: ١. ئەسپاباتێ کە شتێکی لێ دروست بێ ٢. ئامێر؛ ئامراز؛ ئەوەی بۆ بەڕێوە بردنی کار، دروست کردنی شتێ یان گەیشتن بە ئامانجێ پێویستە ‹کەرستەی گواستنەوە› ٣. کەل‌وپەل؛ شت‌ومەک؛ ئەسپابات ‹کەرستەی خانوو؛ کەرستەی بازاڕ› ☰ ١. مواد اولیه ٢. ابزار ٣. وسایل

**کەرسل** / kersil/: ناو. تەرسەقول؛ قەرسەقول ☰ سرگین الاغ

**کەرسمە** / kers(i)me/: ناو. ڕەگێکە لە کەپۆی کەردا دەیبڕن ☰ رگی در بینی الاغ کە آن را قطع می‌کنند

**کەرسون** / kersun/: ☜ **کەرسون**

**کەرسۆنە** / kersone/: ناو. تەپاڵە کێویلە ☰ تاپالەی

دشتی

**کەرسون / kersûn/**: ناو. تاوە؛ کەرسون؛ ناولنگان؛ ئاخلەوێک ☰ تاوه

**کەرسە / kerse/**: ☜ **کەرستە**

**کەرسەپ / kersep/**: ☜ **کەرەوز**

**کەرسەڕ / kerseř/**: ناو. کەرسەڕە: ۱. قۆڕقۆڕە؛ مزراح؛ گیزگیزە؛ خولخولەی ناو کۆڵدراو ۲. جۆرێ مراوی ☰ ۱. گردنای توخالی ۲. نوعی مُرغابی

**کەرسەڕە / kerseře/**: ☜ **کەرسەڕ**

**کەرسەک / kersek/**: ☜ **کەرسەگ**

**کەرسەگ**[1] **/ kerseg/**: ناو. کەرسەک؛ سندە؛ کلۆخاکی زل ☰ کلوخ بزرگ

**کەرسەگ**[2]: ئاوەڵناو. *[کینایە]* کەرسەک؛ بە دیمەن گێلی لە بنەوە شەیتان ☰ مارمولک؛ به ظاهر کودن اما تودار

**کەرسین / kersîn/**: چاوگ. ۱. وشک بوونەوە ۲. مەیین؛ گرسان ☰ ۱. خشک شدن ۲. مُنعقد شدن

**کەرش / kerş/**: ☜ **کرش-۱**

**کەرشین / kerşîn/**: ئاوەڵناو. ۱. زگزل ۲. *[پلار]* سەیدی بە درۆ ☰ ۱. شکم گنده ۲. سیّد دروغین

**کەرفتن / keriftin/**: چاوگ. کەرخ بوون؛ کەرخین؛ بێز هەستان (لە خواردن یان هەر شتێک) ☰ دل به هم آمدن (از غذا یا هر چیزی)

**کەرفس / kerifs/**: ☜ **کەرەوز**

**کەرک / kerk/**: ناو. ۱. لەت؛ پارچە ۲. کەرکت؛ عەبای بێقۆڵ ۳. کەرتەپەز؛ بەشێ لە مێگەل ☰ ۱. قطعه؛ پاره ۲. قبای بی‌آستین ۳. قسمتی از گله

**کەرکت / kerkit/**: ☰ ☜ **کەرك -۲**

**کەرکریک / kerk(i)rîk/**: ☜ **کرۆژنه**

**کەرکم / kerkim/**: ☜ **کەیکف**

**کەرکنج / kerkinc/**: ☜ **قرژانگ**

**کەرکوڕی**[1] **/ kerkuřî/**: ناو. هۆڵی کەر ☰ کرّه‌خر

**کەرکوڕی**[2]: ئاوەڵناو. *[پلار]* نەفام؛ گێلۆکە ☰ ابله

**کەرکوژ / kerkuj/**: ☜ **کەرخنکێنە**

**کەرکوژە / kerkuje/**: ☜ **کەرخنکێنە**

**کەرکوڵ / kerkuł/**: ☜ **کەرکۆڵ -۲**

**کەرکۆت / kerkot/**: ☜ **گۆگرد -۱**

**کەرکۆڵ / kerkoł/**: ناو. کەرکۆڵک: ۱. جاش؛ جاشک؛ دەحشک ۲. کەرکول؛ گیایەکی سەرخڕی بەدڕکە ۳. گیایەکە لە تیرەی کەما و هەڵز ☰ ۱. کُرەخر ۲. گیاهی خاردار ۳. گیاهی از تیره انجدان

**کەرکۆڵک / kerkołik/**: ☜ **کەرکۆڵ**

**کەرکوتی / kerkûtî/**: ناو. شێوێکە لە گەنمەکوتاو دروست دەبێ ☰ آشی است

**کەرکوش / kerkûş/**: ناو. جۆرێ ترێی نەباش ‹ئەز قوربانۆ پەشووشۆ/ ڕەزەک دانێ ژ کەرکووشۆ/ تولێ نەبوو بدە مووشۆ! «مەسەل»› ☰ نوعی انگور نامرغوب

**کەرکوڤی / kerkûvî/**: ☜ **کەرەکێوی**

**کەرکە / kerke/**: ناو. ۱. کەرگراف؛ سادوڕگە؛ نیودوڕگە؛ نیمچە جزیرگە؛ نیمچەدوڕگە؛ جزیرەئاسا؛ زەوینێک سێ لای ئاو بێ و لایەکی وشکانی ‹کەرکەی عەرەبستان› ۲. فرۆ؛ قاقنات؛ خۆراکێکە لە ژەک و شیر ☰ ۱. شبه‌جزیره ۲. آغوز پُخته

**کەرکەت / kerket/**: ناو. سیسارگ؛ کەرکەس ☰ کرکس

**کەرکەرۆک / kerkerok/**: ناو. کەرکەرۆکە؛ کەرکەوکە؛ بەرزایی لای خوارووی چوارچێوەی درگا ☰ بلندی چهارچوب پایینی در

**کەرکەرۆکە / kerkeroke/**: ☜ **کەرکەرۆك**

**کەرکەس / kerkes/**: ناو. سیسارگ؛ کەرکەت ☰ کرکس

**کەرکەمەڕ / kerkemeř/**: ناو. پرگ؛ بڕکە ☰ بخشی

از گله

**کەرکەوکە** / kerkewke/: ☜ **کەرکەرۆك**

**کەرکی** / kerkî/: ☜ **کەرەکی**

**کەرکیت** / kerkît/: ناو. کەڵکیت؛ کارازا؛ دەف؛ دەفە؛ هەپک؛ هەپۆ؛ هەپە؛ ئامرازێکی کانزایی و قورس بۆ کوتانەوەی پۆ ‹دەست و کەرکیتی کچی نازداری هەوشاری نەبا/ چۆن دەڕازاوە بە قالی شار و بازاڕی سنە؟ «هێمن»› ☳ دفته؛ شانەی پودکوبی

**کەرکێفاتمێ** / kerkêfat(i)mê/: ناو. تاژیلۆکە؛ کولەحاجی؛ جۆرێ کولەی باریکەی زیت ☳ آخوندک

**کەرگ** / kerg/: ناو. کەرگی؛ کەرگە؛ کەڕکی؛ کەڕگ؛ مامر؛ مریشک ☳ مرغ خانگی

**کەرگاکۆرە** / kergakore/: ناوەلکار. کەمووسکە؛ زۆر کەم ☳ بسیار اندک

**کەرگان** / kergan/: ناو. ١. دەفری ترێ تێدا گوشین ٢. گوشکە بۆ دۆشاو کردن ☳ ١. ظرف آبگیری انگور ٢. عصّاری

**کەرگراڤ** / kerg(i)rav/: ☜ **کەرگە ـ١**

**کەرگۆوە** / kergowe/: ☜ **کەروێشك**

**کەرگۆه** / kergoh/: ☜ **کەروێشك**

**کەرگو** / kergû/: ☜ **کەروێشك**

**کەرگە** / kerge/: ناو. ١. دەسک؛ دەسە ٢. گوشینگەی هەنگوور ٣. مامر؛ مریشک ☳ ١. دسته ٢. عصّاری ٣. مُرغ خانگی

**کەرگەتەشی** / kergeteşî/: ☜ **کەرتەشی**

**کەرگەداس** / kergedas/: ناو. ١. دەسکەداس؛ کلکەداس ٢. کەمەی داس ☳ ١. دستەی داس ٢. قوس داس

**کەرگەدەن** / kergeden/: ناو. کەرگەدەنگ: ١. گیانەوەرێکی گیاخۆری زۆر زلە، شاخێک یان دووی لە سەر کەپۆ هەیە، پێستی زۆر ئەستوورە و ئەوسا دەیانکردە سپەر بۆ شەڕەشمشێر ٢. *[پلار]* مرۆی زەلام و نەفام ☳ ١. کرگدن ٢. لندهور ابله

⊡ **جواو کەرگەدەن نەدانەوە:** گوێ بۆ قسەی کەس شل نەبوون ☳ گوش بە حرف کسی بدهکار نبودن

**کەرگەدەنگ** / kergedeng/: ☜ **کەرگەدەن**

**کەرگەز** / kergez/: ناو. سیسارگ؛ سیسارگە کەچەڵە ☳ کرکس

**کەرگەلارێ** / kergelarê/: ناو. باڵدارێکە ☳ پرندەای است

**کەرگەوز** / kergewiz/: ناو. شوێنی خۆ گەوزاندنی گوێدرێژ ☳ محل غلتیدن اُلاغ

**کەرگی** / kergî/: ☜ **کەرگ**

**کەرگێ** / kergê/: ناو. *[شوورەیی]* کەسێ کە ئیلاقەی کەر دەکا ☳ کسی کە با خر جماع می‌کند

**کەرگێڕەوە** / kergêřewe/: ناو. *[پلار]* پەرژینی دەوری شتێک بۆ ئەوەی وە نێوی نەکەون ☳ موانع هشدار در معبر

**کەرلەوەڕێن**[1] / kerleweřên/: ناو. شوانی کەران ☳ اُلاغچران

**کەرلەوەڕێن**[2]: ناوەلناو. *[پلار]* خاوەن کاری سووک و بێبایی ☳ دارای کار بی‌ارزش

**کەرم** / kerm/: ☜ **کرم**[1]

**کەرمات**[1] / kermat/: ناو. ١. ڕەوتی بووژانەوەی شینایی؛ گەشە کردن ٢. *[کینایە]* کاری وشیار کردنەوەی مەردم ☳ ١. دوبارە جان گرفتن گل و گیاه ٢. بیدار کردن مردم

**کەرمات**[2]: ناوەلناو. زەحف؛ زۆر زیاد ☳ بسیار زیاد

**کەرماشێن** / kermaşên/: ناو. *[پلار]* پاسکیل؛ دووچەرخە ☳ دوچرخه

**کەرمجین** / kerm(i)cîn/: ☜ **کورمژین**

**کەرمجینی** / kerm(i)cînî/: ناو. ١. کرمەڕێزی ٢. *[کینایە]* زۆر چەپەڵی و گەماری ☳ ١. فرایند کرم

ریختن ۲. آلودگی بسیار

**کەرمخ** / kermix/: ناو. گیایەکی گەڵادەرزییە 🕮 گیاهی برگ سوزنی

**کەرمژین** / kerm(i)jîn/: ☜ کرمەژن

**کەرمشک** / kermişk/: ناو. تامیسک؛ تیمیسک 🕮 تبخال

**کەرمشین** / kerm(i)şîn/: ☜ کەرمەژین

**کەرمک** / kermik/: ☜ کرمەژن

**کەرملاندن** / kermilandin/: چاوگ. تێکەڵ کردن 🕮 آمیختن

**کەرمندار** / kermindar/: ناو. کاری بەخشینی خاوەن دەسەلات 🕮 بخشش صاحب قدرت

**کەرمۆز** / kermoz/: ناو. شینەمۆزە؛ مێشێکی چزووداری درشتە بە مالاتەوە دەدا 🕮 نوعی مگس درشت نیشدار

**کەرمە** / kerme/: ناو. کەمرە؛ کەپرە؛ گەڕمە؛ ڕیخی بەرپێدراوی ڕەقهەلاتوو 🕮 سرگین پامال شدەی خشک و سفت

**کەرمەژین** / kermejîn/: چاوگ. کرمچین؛ کرمشین؛ کەرمشین؛ قرمچین؛ چرچ بوون 🕮 چروکیدن

**کەرمەلیس** / kermelîs/: ناوەڵناو. مێخۆش؛ ترش و شیرین 🕮 مَلَس؛ تُرش و شیرین

**کەرمێز** / kermêz/: ☜ خەرمێز ـ۱

**کەرمێش** / kermêş/: ناو. ۱. مێشی درشت ۲. نێری مێشەنگوین 🕮 ۱. خرمگس ۲. زنبورعسل نر

**کەرناز** / kernaz/: ناو. *[پلار]* خەرناز؛ ناز و ئەدای کەسێ کە بۆ ناز کردن ناشێ 🕮 ناز شُتُری

**کەرنگ** / kering/: ناو. قورینگ؛ باڵدارێکە 🕮 پرندەای است

**کەرنەڤاڵ** / kernevał/: ناو. کارناواڵ؛ کۆسەکاری؛ ئاهەنگێکی تایبەت بریتی لە گۆرانی و هەڵپەڕکێ و شایی کە برێک جلی ڕەنگامە لەبەر دەکەن، دەمامک هەڵدەبەستن و خۆیان وەک گیانەوەران لێ دەکەن 🕮 کارناوال

**کەروا** / kerwa/: ☜ کەربا

**کەرواڵە** / kerwale/: ☜ کەرەواڵە[1]ـ۲

**کەروان** / kerwan/: ☜ کاروان

**کەروایی** / kerwayî/: ☜ کەربا

**کەروشک** / keruşk/: ☜ کەروێشك

**کەروڤە** / keruve/: ☜ کرێوە

**کەروە** / kerwe/: ناو. ڕاو؛ ڕاڤ؛ شکار؛ ئشکار؛ شڕ 🕮 شکار

**کەروەستەک** / kerwestek/: ☜ کەرترێتە[2]

**کەرویە** / keruye/: ☜ کەروێشك

**کەروێ** / kerwê/: ☜ کەروێشك

**کەروێشک** / kerwêş(i)k/: ناو. کەوریشک؛ کەورێشک؛ کەرووشک؛ کێفروشک؛ کێڤرویشک؛ کورشک؛ کوێریشک؛ کەروشک؛ کەڤرۆشک؛ کیڤروشک؛ کیڤریشک؛ کێرووشک؛ کێریشک؛ کێفرۆشک؛ کەروێ؛ کەوریە؛ کەریە؛ کەرویە؛ کێرگوو؛ کەرگوو؛ کەرگۆهـ؛ کەرگۆوە؛ هەوریشە؛ هەروێشە؛ خەروێ؛ خەروی؛ هەروی؛ هەڕۆڵشە؛ قولەشین؛ گیانەوەرێکی گوهانداری گیاخۆر، شتجاو، گوێدرێژ، جووچک کورت و خۆشبەزە 🕮 خرگوش

⊡ **کەروێشک بە عەرابە گرتن:** *[مەجاز]* زۆر تاقەت هێنان و پشوودرێژی نواندن 🕮 از غوره حلوا ساختن

**کەروێشکە** / kerwêşke/: ناو. کەورێشکە؛ کێرووشکە؛ ڕەوتی بزوتنەوەی دەغڵ و سەوزەی بەهار بە دەم باوە، کە وەک پێلی دەریا دەنوێنێ 🕮 خرام سبزە از باد

⊡ **کەروێشکە کردن:** بزووتنی سەوزە بە دەم باوە ‹دار دەری کردووە چرۆ/ کەروێشکەی کرد گەنم و جۆ «هێمن»› 🕮 خرامیدن سبزە از باد

**کەرویشکەخەو** / kerwêşkexew/: ناو. سەرخەو؛ سووکەخەو 🇮🇷 خواب سبک

**کەرویشکەمەلە** / kerwêşkemele/: ناو. جۆرێک مەلەی وەک ڕەوتی کەرویشک 🇮🇷 شنای خرگوشی

**کەرۆ** / kero/: ئاوەڵناو. ۱. کول؛ نەتیژ؛ نەبڕ ۲. *[کینایە]* بێئاوەز 🇮🇷 ۱. کُند ۲. احمق

**کەرۆکە** / keroke/: ئاوەڵناو. *[پلار]* حۆل؛ گێلۆکە 🇮🇷 هالو

**کەرۆڵە** / keroļe/: ☜ کەرەواڵە[۱]ـ۲

**کەرۆن** / keron/: ناو. ئالوودار 🇮🇷 چوب سقف بر دیرک

**کەروو** / kerû/: ناو. ۱. جالجالووکە؛ کاکلەمووشان ۲. داوی جالجالووکە 🇮🇷 ۱. عنکبوت ۲. تار عنکبوت

**کەرووس** / kerûs/: ☜ کەرەوز

**کەرووشک** / kerûşk/: ☜ کەرویشك

**کەرە**[۱] / kere/: ناو. ۱. کەرێ؛ ڕۆنی قاڵنەکراو ۲. بەردەڵان؛ ڕەقەن؛ تمتمان 🇮🇷 ۱. کرەی خوراکی ۲. سنگلاخ

**. کەرە**[۲]: پاشەوشە. ـ کەر (ئاوەدانکەرە؛ دلخۆشکەرە) 🇮🇷 ـ کُن؛ ـ کُنَک

**کەرەب** / kereb/: ناو. ۱. ☜ کارەبا ۲. خەم؛ خەفەت 🇮🇷 ۱. ☜ کارەبا ۲. اندوه

**کەرەباب** / kerebab/: ☜ کەڵەشێر

**کەرەبە** / kerebe/: ☜ کارەبا

**کەرەپوول** / kerepûl/: ناو. میرات؛ کەلەپوور؛ دارایی لە مردوو جێماو 🇮🇷 ارث

**کەرەپیاو** / kerep(i)yaw/: ئاوەڵناو. *[پلار]* ۱. زۆر ئازاو نەترس ۲. بێئاوەز؛ کەمفام ۳. دڵپاک و سەرسەری 🇮🇷 ۱. مُتهوّر ۲. احمق ۳. خوش‌قلب و سطحی

**کەرەتاو** / keretaw/: ناو. کەرەی تاویاوە کە باش قاڵ نەکرابێ 🇮🇷 کرەی ذوب‌شده

**کەرەترێنە** / keret(i)řêne/: ناو. گیایەکی سەر بە درکە کەر حەزی لێ دەکا 🇮🇷 گیاهی است

**کەرەتوو** / keretû/: ناو. کردوو؛ کەردوو؛ کەرتوو 🇮🇷 کرت کشاورزی

**کەرەتە** / kerete/: ناو. پانیەکێش؛ پاژنەهەڵکێش 🇮🇷 پاشنه‌کش

**کەرەجنە** / kerec(i)ne/: ناو. کەرەکەوڵە؛ مێروویەکە لە شوێنی تەڕ و نماوی ماڵدا دەژی، ڕەنگی خۆڵەمێشی، بن زگی سپی و لاقی وردە 🇮🇷 حشره‌ای است

**کەرەجی** / kerecî/: ناو. قوفە؛ قوففە؛ جۆرێ بەلەم 🇮🇷 قایق کرجی

**کەرەخنە** / kerexne/: ناو. مەقاش؛ پۆلگر؛ ماشەی ئاگر 🇮🇷 آتش کاو

**کەرەدان** / keredan/: ناو. کووپەڵەی جێ کەرە 🇮🇷 ظرف کره

**کەرەز** / kerez/: ناو. گیایەکە دەیکرۆژن ئاوێکی شیرنی هەیە 🇮🇷 گیاهی است

**کەرەزەڕێ** / kerezeřî/: ئاوەڵکار. زۆرەکی؛ بە زۆرەملێ 🇮🇷 زورکی

**کەرەسا** / keresa/: ☜ کەوەر ـ۱

**کەرەسب** / keresib/: ☜ کەرەوز

**کەرەسپ** / keresip/: ☜ کەرەوز

**کەرەستە** / kereste/: ☜ کەرستە

**کەرەستی** / kerestî/: ئاوەڵناو. کەرەنسی؛ هەمیشە سێبەر 🇮🇷 همیشه سایه

**کەرەسە** / kerese/: ☜ کەرستە

**کەرەشان** / kereşan/: ناو. هەنگوێنی ڕەش هەڵگەڕاو 🇮🇷 عسل سیاهرنگ

**کەرەشێر** / kereşêr/: ☜ کەڵەشێر

**کەرەشێل** / kereşêl/: ☜ کەڵەشێر

**کەرەفس** / kerefs/: ☜ کەرەوز

**کەرەک** / kerek/: ☜ کەرەواڵە[۱]ـ۲

**کەرەکولان** / kerekulan/: ☜ کەرەکێوی

**کەرەکۆشە** / kerekoşe/: ناو. کەرەوشە؛ جۆرێک جگەن ☰ نوعی جگن

**کەرەکەوڵە** / kerekewłe/: ناو. پیرۆشک؛ پیرێژنۆکە؛ خلێرە؛ خەرخودا؛ داپیرۆشک؛ کەرەجنە ☰ خرخاکی

**کەرەکی** / kerekî/: ناوەڵکار. کەرکی؛ کەرانە؛ وەک کەر ☰ خرکی؛ خرصفتانه

**کەرەکێفی** / kerekêfî/: ☜ کەرەکێوی

**کەرەکێوی** / kerekêwî/: ناو. کەرەکولان؛ کەرکووڤی؛ کەرەکێفی؛ خەرگۆڕ؛ خەرگۆلک ☰ گورخر

**کەرەگا** / kerega/: ناو. ١. جوانەگایەک کە سواری چێل دەبێ ٢. *[کینایی، پلار]* زۆرداری زاڵم ☰ ١. گاو گُشن ٢. زورگو

**کەرەگایی** / keregayî/: ناو. *[کینایی، پلار]* زۆربێژی؛ ملهوڕی ☰ زورگویی

**کەرەلیاس** / kerelyas/: ناو. چێرڤان؛ ڕاگەیێنەر؛ جاڕچی ☰ جارچی؛ مُنادی

**کەرەم** / kerem/: ناو. ١. کاری بەخشین؛ دانی بێقەرەبوو ٢. فایدە؛ بەهرە ☰ ١. بخشش ٢. فایده

◘ **کەرەم کردن**: دەس بە کارێ کردن ‹هەڤالێ هێژا، کەرەم کە!› ☰ اقدام کردن

**کەرەمتو** / keremtû/: ☜ کەرەنتو

**کەرەمتوکێش** / keremtûkêş/: ناو. ماڵەغانگێر؛ کەسێک کە بە مەڵەغان گیا دەدووریت ☰ دروگر با داس بُلند

**کەرەمدار** / keremdar/: ناوەڵناو. دلاوا؛ دەهندە؛ جوامێر ☰ سخاوتمند

**کەرەنتو** / kerentû/: ناو. کاسۆخ؛ کەرەمتوو؛ کەلاندر؛ کەلەندر؛ کەلەندی؛ کێلەندی؛ ماڵەغان؛ مەڵەغان؛ داسی درێژی دەسکدرێژ کە بە دوو دەس دەکار دەکرێ ☰ نوعی داس دستەبلندِ لبەپهن

**کەرەنزەر** / kerenzer/: ناوەڵناو. جەوانی سەوزەڕەنگ ☰ گندمگون

**کەرەنسی** / kerensî/: ☜ کەرەستی

**کەرەنگ** / kereng/: ناو. ١. کەرمێش؛ نێری مێشەنگوین ٢. سوورەقورینگ؛ قازیسوور ٣. ☜ کەنگەر ☰ ١. زنبورعسل نر ٢. فلامینگو ٣. ☜ کەنگەر

**کەرەنگەڵ** / kerengeł/: ناو. قانگەلاشک؛ دڕووی کەنگر ☰ بُتەی خُشک کنگر

**کەرەنگێزە** / kerengêze/: ناو. خەرمەگەز؛ کۆرۆخ؛ کەرمێش؛ مێشەکەرانە ☰ خرمگس

**کەرەواڵە**[١] / kerewałe/: ناو. کەرەوانکە؛ کەڕەواڵە؛ کەڕواڵە: ١. باڵدارێکە لە مراوی دەکا تۆزێ دندووکی خوارە، لە دەم ئاواەن دەژی ٢. کەرواڵە؛ کەرۆڵە؛ کەرەک؛ کەرەوان؛ کەرەوانە؛ کەرەوەرە؛ کەرەوەڵە؛ هەوێردە ☰ ١. کاروانک ٢. بلدرچین

**کەرەواڵە**[٢]: ناوەڵناو. *[پلار]* کەڕەواڵە؛ کەڕواڵە؛ حۆل و کەمئاوەز ☰ سادەلوح

**کەرەوان** / kerewan/: ☜ کەرەواڵە[١]ـ٢

**کەرەوانکە** / kerewanke/: ☜ کەرەواڵە[١]

**کەرەوانە** / kerewane/: ☜ کەرەواڵە[١]ـ٢

**کەرەور** / kerewir/: ناو. هەور؛ هەوری؛ ئیسفەنج ☰ اسفنج

**کەرەوز** / kerew(i)z/: ناو. کرسپ؛ کەرسەپ؛ کەرەسب؛ کەرەسپ؛ کەرەوس؛ کەرووس؛ کەرفس؛ کەرەفس؛ گیایەکی ئالیکی دوو ساڵەیە بە گەڵای بریقەدار و لقی ئەستوورەوە کە نەرم و بۆنخۆشە و دەخورێ ☰ کرفس

**کەرەوزان** / kerewzan/: ☜ کەوەر ـ١

**کەرەوزەکێویلە** / kerewzekêwîle/: ناو. سیپەلە؛ سیپەرە؛ باوەشێنە ☰ سرخس

**کەرەوس** / kerews/: ☜ کەرەوز

**کەرەوشە** / kerew(i)şe/: ناو. کەرەکۆشە؛ جۆرێک

جگەن 🇮🇷 نوعی جگن

**کەرەوە**[1] / kerewe/: ☜ **کەڵەوە**

**کەرەوە**[2]: ئاوەڵناو. ١. پێکهێنەر؛ جێبەجێکەر ٢. ئاوەڵاکەر؛ بازکەر 🇮🇷 ١. کننده ٢. گشاینده

**- کەرەوە**[3]: پاشەوشە. ١. ئاوەڵاکەر ‹درگاکەرەوە› ٢. درز پێدەر؛ پێڕاکەر ‹ڕێکەرەوە› ٣. پێکهێنەر؛ جێبەجێکەر ‹پانکەرەوە؛ فێنککەرەوە؛ سازکەرەوە› ٤. دروستکەر ‹خۆشکەرەوە؛ ماڵکەرەوە› 🇮🇷 ١. ـ بازکُن ٢. ـ گُشا ٣. ـ کُننده ۴. سازنده

**کەرەوەت** / kerewet/: ناو. پێشخانە؛ کەوشکەن 🇮🇷 راهرو

**کەرەوەرە** / kerewere/: ☜ **کەرەواڵە**[1]**_٢**

**کەرەوەڵە** / kerewełe/: ☜ **کەرەواڵە**[1]**_٢**

**کەرەوێتە** / kerewête/: ☜ **کراوات**

**کەرەه** / kereh/: ئاوەڵناو. چڵکن؛ گەمار؛ پیس و پەڵۆخ 🇮🇷 چرکین

**کەرهەنگ** / kerheng/: ناو. کەرەنگ؛ کەرمێش 🇮🇷 زنبورعسل نر

**کەرهێ** / kerehê/: ناو. جۆرێ گیای شنگ 🇮🇷 نوعی گیاه شنگ

**کەری**[1] / kerî/: ناو. ١. کەرکە پەز؛ برێ لە مێگەل ٢. کەرت؛ لەت؛ پاژ ٣. *[مەجاز، پلار]* بێئاوەزی؛ نەفامی 🇮🇷 ١. قسمتی از گلەی گوسفندان ٢. پارە؛ قطعه ٣. حماقت

**کەری**[2]: ئاوەڵناو. لەت؛ کەت؛ کەل 🇮🇷 پارە

**کەریاپەز** / keryapez/: ناو. جۆل؛ کەرکە مەڕ 🇮🇷 قسمتی از گلە

**کەریفۆک** / kerîfok/: ☜ **کریفۆك**

**کەریە** / kerye/: ☜ **کەروێشك**

**کەریەتی** / kerîyetî/: ناو. *[مەجاز، پلار]* کەرایەتی؛ کەرێتی: ١. کاری بێئەقڵانە ٢. دۆخ یان چۆنیەتی گێل و نەفام بوون 🇮🇷 ١. کار احمقانە ٢. حماقت

**کەرێ** / kerê/: ناو. ١. کەرە ٢. کاژیلەی شەش مانگان 🇮🇷 ١. کره ٢. بُزغالەی شش ماهه

**کەرێتی** / kerêtî/: ☜ **کەریەتی**

**کەرێز** / kerêz/: ☜ **کارێز**

**کەرێزکەن** / kerêzken/: ناو. قومەشکەن؛ کەسێ کە بیر و کەرێز هەڵدەکەنێ 🇮🇷 مُقنی

**کەرێزە** / kerêze/: ☜ **کارێز**

**کەڕ** / keř/: ئاوەڵناو. ١. کەر؛ کهەڕ؛ کهەڕۆ؛ کێڕ؛ کرێڵ؛ گوێکپ ٢. تیر؛ خەست ‹ماستاوێ کەڕ بگرەوە!› 🇮🇷 ١. ناشنوا ٢. غلیظ

▣ **کەڕ بوون**: ١. کپ بوونی گوێ ‹کەڕ بی و کەر نەبی! «مەسەل»› ٢. سووڕانی زۆر بە لەرزەی مزراح وا کە لە دەنگ بکەوێ 🇮🇷 ١. کر شدن ٢. چرخیدن با شتاب گردنا

**کەڕ کردن**: ١. گوێکپ کردن ٢. خەست کردنەوەی تراو ٣. داکوتانی گیزگیزە، جۆرێ کە دەنگی ببڕێ 🇮🇷 ١. کر کردن ٢. غلیظ کردن آبکی ٣. چرخاندن سریع گردنای توخالی طوری که صدای آن بخوابد

**بانگ بە گوێی کەڕاندا کردن**: کاری بێبەهرە کردن ‹بێژە: من هەر بەو فەرمانەی بۆم هاتووە، دەوترسێنم. بەڵام بانگ بە گوێی کەڕاندا کردن و ترساندنیان بەهرەی نییە «هەژار، قورئان»› 🇮🇷 آب در هاون کوبیدن

**خۆ لێ کردنە کەڕ**: خۆ لێ گێل کردن 🇮🇷 خود را به کوچەی علی چپ زدن

**کەڕا** / keřa/: ناو. گاشەبەرد؛ تەلەسەنگ؛ بەردی زل 🇮🇷 سنگ بزرگ

**کەڕاژە** / keřaje/: ☜ **کرێژ**

**کەڕافی** / keřafî/: ناو. تینگی زۆر کە مرۆ بخاتە گیانەڵاوە 🇮🇷 عطش

**کەڕاکە** / keřake/: ناو. لامل؛ باگوێ؛ گۆشەک؛

بەینی گوێ و بنی کاکیلە ☰ بناگوش

⊡ **چوونە کەڕاکەدا:** /مەجاز، پلار/ فام کردن؛ باش حاڵی بوون ☰ شیرفهم شدن

**کەڕاکی** / keřakî/: ئاوەڵناو. ساغ و پتەو؛ دور لە نەخۆشی ☰ صحیح و سالم

**کەڕان**[1] / keřan/: چاوگ. قرتان؛ قرتیان؛ پچڕان ☰ گُسستن

**کەڕان**[2]: ناو. کوتکی زلی بەردشکاندن ☰ پُتک بزرگ سنگ‌شکن

**کەڕاندن** / keřandin/: چاوگ. قرتاندن؛ قرتانن؛ کرتاندن؛ پچڕاندن ☰ گُسستن؛ پاره کردن

**کەڕانە**[1] / keřane/: ناو. لۆسە؛ مەلغە؛ باری؛ نویڵ ☰ اهرُم

**کەڕانە**[2]: ئاوەڵناو. دارا؛ زەنگین؛ دەوڵەمەند ☰ ثروتمند

**کەڕڕە** / keřře/: ناو. ١. بەردەڵان؛ زەوینی پڕ لە بەرد ٢. کەللە؛ سەرەتا ☰ ١. زمین سنگلاخ ٢. سراغاز

⊡ **کەڕڕەی بەیانی:** تاریک و ڕوونی بەیانی ☰ کلّەی سحر

**کەڕک** / keřk/: ناو. ١. خرچە؛ قەرەخرچە ٢. کۆتەڵی کەر لە دار بۆ باز بە سەردا هاویشتن ٣. هەنجیری کاڵ ٤. برینگ؛ برنگە ☰ ١. خربُزەی کال ٢. خرک ٣. انجیر کال ۴. دوکارد

**کەڕکی** / keřkî/: ناو. مامر؛ کەرگ؛ مریشک ☰ مُرغ خانگی

**کەڕگ** / keřg/: ☜ کەرگ

**کەڕگ** / keřig/: ☜ کەڕوو

**کەڕگاسیای** / keřgas(i)yay/: ناو. مریشکی ڕەش کە دەڵێن ودمی باش نییە ☰ مرغ خانگی سیاه که گویا شوم است

**کەڕگامیسری** / keřgamîsrî/: ناو. بۆقلە؛ قەلەموونە؛ بەقلەمووت؛ عەلەشیش ☰ بوقلمون

**کەڕواڵە** / keřwałe/: ☜ کەڕەواڵە[1]ـ١

**کەڕواوی** / keřwawî/: ئاوەڵناو. برش‌هەڵێناو ☰ کپک‌زده

**کەڕولاڵ** / keř û lał/: ئاوەڵناو. لاڵوپاڵ؛ بە گوێ کەڕ و بە زمان لاڵ ☰ کر و لال

**کەڕوو** / keřû/: ناو. کاپەک؛ کفک؛ کوفک؛ کەپرۆکە؛ کەڕە؛ کەڕەوڵ؛ کەڕەکیف؛ کەڕەکیفە؛ کەڕگ؛ کیف؛ کەپەک؛ سفی؛ کرپک: ١. برش؛ جۆرێ کارگ و لاکوتی یەکجار ورد کە وەک توێژاڵێ شین لە سەر هێندێک خواردەمەنی وەک نانی کۆن دەنیشێ و تام و بۆنی دەگۆڕێ و بڕێکیشیان بۆ دەرمان دەبن ٢. توێژاڵکی ترشاو ☰ ١و٢. کپک

⊡ **کەڕوو هەڵێنان:** کەڕوو هێنان؛ برش هێنان؛ پرگ (هەڵ)هێنان؛ کەڕەکیفە هاوردن؛ کەڕواوی بوون؛ گەشە ساندنی کەڕوو لە سەر خۆراک ☰ کپک زدن

**کەڕوو هێنان:** ☜ کەڕوو هەڵێنان

**کەڕوولێداو** / keřûlêdaw/: ئاوەڵناو. کووفکی؛ برش‌هێناو ☰ کفک‌زده

**کەڕە**[1] / keře/: ناو. ١. ☜ کەڕوو ٢. قەلەپڕ؛ قەلەفر؛ فرۆیەک کە لە قەفەقامیشدا گەرم دەکرێ و وەک پەنیری لێ دێ ٣. کلووە بەفری وردی تەنکەڵە ٤. ☜ کەڕەهەنجیر ☰ ١. ☜ کەڕوو ٢. نوعی آغوز پخته ٣. دانەی برف نازک و ریز ۴. ☜ کەڕەهەنجیر

**کەڕە**[2]: ☜ کەڕیلە

**کەڕە**ـ[3]: پێشوشە. ١. ساویلکە ‹کەرەسۆفی› ٢. دەبەنگ ‹کەڕەپەژم› ☰ ١. سادەلوح ٢. نفهم

**کەڕەپوە** / keřep(i)we/: ☜ کەڕەپۆ

**کەڕەپۆ** / keřepo/: ناو. کەڕەپوە؛ کەڕەپوو: ١. ڕوەکێکە لە قامیش دەکا، بەرێکی هەیە وەک وردەپەمۆ ٢. داری کۆنی ڕزیو ☰ ١. نوعی نی کە

ثمرش به ریزەپنبه می‌ماند ٢. کُندەی کُهنه و پوسیده

**کەڕەپۆسەر / keřeposer/**: ئاوەڵناو. *[کینایە، پلار]* پیری سەر سپی و کەمفام ☰ پیر نادان

**کەڕەپوو / keřepû/**: ☜ **کەڕەپۆ**

**کەڕەپەژم / keřepejm/**: ئاوەڵناو. *[کینایە، پلار]* ١. گوێنەبیس ٢. نەفام و کەمئاوەز ☰ ١. حرف‌نشنو ٢. ابله

**کەڕەت / keřet/**: ناو. ڕا؛ جار؛ کەشە؛ دەحە؛ هەڵ ‹بۆچی نەگریم، سەد کەڕەتم دڵ دەشکێنی/ بۆ مەی نەڕژێ، شیشە لە سەد لاوە شکاوە! «نالی»› ☰ بار، دفعه

**کەڕەتێ / keřetê/**: ☜ **کەڕەتێك**

**کەڕەتێك / keřetêk/**: ئاوەڵکار. کەڕەتێ؛ جارێک ‹کەڕەتێک دواندم› ☰ یک‌بار

**کەڕەسیسە / keřesîse/**: ناو. ١. کەڕە؛ کلووەبەفری تەنکی ورد ٢. ئاپۆرەی ئاژەڵ و مرۆ ☰ ١. دانەی برف ریز سبک ٢. ازدحام

⊡ **کەڕەسیسە دان**: سەر کردنە ناو یەک؛ کۆمەڵ بەستن ‹پۆلێک باڵندە لە سەرمان کەڕەسیسەیان دابوو› ☰ گرد هم آمدن

**کەڕەعەوام / keře'ewam/**: ئاوەڵناو. *[پلار]* حەپۆل؛ نەزان ☰ ابله

**کەڕەفوو / keřefû/**: ناو. جۆرێ هەنجیر ☰ نوعی انجیر

**کەڕەک / keřek/**: ناو. ١. جۆرێ پێشکەی ورد ٢. فەرەنجی بێقۆڵ ☰ ١. نوعی پشەی ریز ٢. پالتوی نمدی بی‌آستین

**کەڕەکونتێ / keřekuntê/**: ئاوەڵناو. کەڕەنسۆ؛ تەواو کەڕ؛ هیچنەبیس؛ گوێ بەتەواوی کپ ☰ کاملاً ناشنوا

**کەڕەکوندە / keřekunde/**: ناو. جۆرێک کوندەیە بە قەد کەو دەبێ، زۆریشی لێ نزیک ببیەوە، هەڵنافڕێ ☰ نوعی جغد

**کەڕە ـ کەڕە / keře keře/**: ئاوەڵکار. بێ‌هەست و چرپە ☰ بی‌سروصدا

**کەڕەکیف / keřekîf/**: ☜ **کەڕوو**

**کەڕەکیفە / keřekîfe/**: ناو. ١. ☜ **کەڕوو** ٢. دۆکەی گیا ☰ ١. ☜ **کەڕوو** ٢. سپیدک گیاه

**کەڕەگۆشە / keřegoşe/**: ناو. خۆرە؛ پیسی؛ نەخۆشی گولی ☰ بیماری جُذام

**کەڕەمار / keřemar/**: ☜ **کۆرەمار**

**کەڕەنا / keřena/**: ناو. ١. جۆرێ شەیپووری زل ٢. بۆڕی؛ دووکەڵکێش؛ ڕۆژینگ ☰ ١. کرنا ٢. دودکش

⊡ **کەڕەنای شتێک لێ دان**: *[کینایە]* شتێک بە شێوەی هەموانی ڕاگەیاندن؛ بانگەواز کردن بۆ شتێک ‹گوتیان لێمە؟/ من/ کەڕەنای جەنگ لێدەدەم «پەشێو»› ☰ **شیپور زدن/ اعلان کردن**

**کەڕەناچی / keřenaçî/**: ناو. بۆڕیەژەن؛ شەیپوورژەن ☰ شیپورچی

**کەڕەناژەن / keřenajen/**: ناو. بۆڕیەژەن؛ شەیپوورچی ☰ شیپورچی

**کەڕەنایی / keřenayî/**: ئاوەڵناو. شەیپووری؛ وەکوو شەیپوور ☰ شیپوری

**کەڕەنسۆ / keřenso/**: ☜ **کەڕەکونتێ**

**کەڕەواڵە / keřewałe/**: ☜ **کەرەواڵە**

**کەڕەوڵ / keřewił/**: ☜ **کەڕوو**

**کەڕەهۆر / keřehor/**: ناو. کەرمەوو؛ بای زۆر گەرمی بەتەوژم ☰ باد گرم و شدید

**کەڕەهوو / keřehû/**: ☜ **کەڕەهۆر**

**کەڕەهەنجیر / keřehencîr/**: ناو. کەڕە؛ هەنجیرێ کە بە کاڵی دەوەرێ ☰ انجیری کە نارسیده می‌ریزد

**کەڕی[١] / keřî/**: ناو. هەر چەشنە نەخۆشینێ کە ئەبێتە هۆی نەبیستن ☰ بیماری کری

**کەڕی[٢]**: ئاوەڵناو. بە گوێی بەل و لوول و درێژەوە ☰

گوش بَلبَلی

**کەڕیل** / keřîl/: ☜ **کەڕیلە**

**کەڕیلە** / keřîle/: ئاوەڵناو. کەڕیل؛ کەڕە؛ گوێ کورت و لووڵ (ئاژەڵ) ≡ گوش کوچک و برجسته (دام)

**کەز**[1] / kez/: ☜ **کەفز**

**کەز**[2]: ئاوەڵناو. کەژ؛ زۆر سپی (پێست) ≡ بسیار سفید (پوست)

**کەزاخ** / kezax/: ئاوەڵناو. کساخ؛ کەساخ؛ کەسخ؛ داپاچراو (لق و پۆپ) ≡ هرس شده

**کەزاختن** / kezaxtin/: چاوگ. کەسخاندن؛ پەرتاوتن ≡ هرس کردن

**کەزاخە** / kezaxe/: ناو. لقێ کە شیاوی هەڵپەرتاوتنە ≡ شاخه‌ای که باید هرس شود

⊡ **کەزاخە کردن:** هەڵپەرتاوتن؛ ڕەز برین؛ باغ برین ≡ هرس کردن درخت و رز

**کەزان** / kezan/: ☜ **قەزوان**

**کەزباندن** / kezbandin/: چاوگ. درۆ/ فشە کردن ≡ دروغ گفتن

**کەزخاندن** / kezxandin/: چاوگ. کزخان؛ کزخاندن؛ کەزاخە کرن؛ پەرتاوتن؛ داپاچین ≡ با تبر یا تیغ چیزی را از بالا به پایین قطع کردن

**کەزلاتەی** / kezlatey/: ناو. کەسەر؛ مەینەت ≡ رنج؛ محنت

**کەزنەزان** / keznezan/: ناو. دەوەنێکە ≡ درختچه‌ای است

**کەزوان** / kezwan/: ☜ **قەزوان**

**کەزەب** / kezeb/: ناو. ١. جەرگ؛ جگەر ٢. زەنگەتە؛ تیسک ≡ ١. جگر ٢. تلسک

**کەزەلوق** / kezeloq/: ☜ **کەزەلۆک**

**کەزەلۆک** / kezelok/: ناو. کەزەلوق؛ گیایەکی بە پنجە ≡ گیاهی است

**کەزی** / kezî/: ناو. ١. پرچ؛ زلف؛ زولف ٢. ☜ **کەفز** ٣. جەگەن؛ گیا حەسیر ٤. بناری چیا ≡ ١. گیسو ٢. ☜ **کەفز** ٣. گیاهی است ۴. کمرکش کوه

**کەزیک** / kezîk/: ناو. گیایەکی دەشتییە ≡ گیاهی است

**کەزیگە** / kezîge/: ناو. ١. شادەمار؛ ڕەگی ئەستوور ٢. جۆی هەڵبەستراو بۆ ئاش ≡ ١. شاهرگ ٢. جوی آب پیوسته به ناو آسیا

**کەزیلە** / kezîle/: ناو. پینەی مەشکە ≡ وصلەی مشک

**کەزین** / kezîn/: ناو. نۆین؛ جۆگەی داپۆشراو ≡ جوی سرپوشیده

**کەزیە** / kezye/: ناو. گیز؛ پرچ؛ کەزی ≡ گیسو

**کەژ**[1] / kej/: ناو. ١. کێش؛ ساو (کەژی گۆرەوییەکەم خاو بۆتەوە) ٢. ☜ **کەژو** ٣. چیا؛ کۆ؛ کێو (کەژ و کێو) ٤. ئاوریشمی خاو ٥. مووی بزنە مەرەزە ٦. وەرز؛ هەرەت ≡ ١. کِش ٢. ☜ **کەژو** ٣. کوه ۴. ابریشم خام ۵. موی مرغوب نوعی بُز ۶. موسم

⊡ **زەوی لە کەژدا بوون:** کاتی چاندن و کار کردن لە سەر زەوی بوون ≡ موسم کشت بودن

**کەژ**[2]: ئاوەڵناو. ١. کەز؛ زۆر سپی؛ فرە چەرمگ ٢. زاڵ؛ زگماک بە مووی سپی و چاوی شینکاڵەوە، کە تاقەتی تیشکی زۆری نییە (ژنێکی شلەی کەژ، کە چاوی لە بەر تاو هەڵنایە، قاچ باریک، لاواز، دەتگوت داردۆژەنگە! هات و دەستی دە دەستی ناین «هەژار، چێشتی مجێور») ٣. موو سپی ئاماڵ شین (بزن) ٤. مل سووری گوێڕەش (بزن) ٥. موو زەرد (مرۆ) ≡ ١. بسیار سفید ٢. زال ٣. سفید رنگ مایل به کبود (بُز) ۴. گردن سرخ سیاه گوش (بُز) ۵. بور

**کەژاڵ**[1] / kejał/: ناو. ١. ئاسک؛ ئاهوو ٢. بزنە کێوی ٣. */کنایە/* گراوی؛ یار؛ دڵبەر ≡ ١. آهو؛ غزال ٢. بُز کوهی ٣. یار؛ معشوقه

**کەژاڵ**[2]: ئاوەڵناو. ١. زەرد؛ کاڵ (چاو) ‹ئاشقی چاوی کەژاڵ و گەردنی پڕخاڵ نیم/ ئاشقی کێو و تەلان و بەندەن و بەردم ئەمن «هێمن»› ٢. گوێچکە سپی و ڕەش (بزن) ☰ ١. آبی (چشم) ٢. گوش سفید و سیاه (بُز)

**کەژاو** / kejaw/: ناو. ١. ☚ کەفز ٢. کاژاو؛ توێژاڵکی سووری سەر ئاو ☰ ١. ☚ کەفز ٢. لایەی قرمز بر آب

**کەژاواژ** / kejawaj/: ئاوەڵناو. خاڵ ـ خاڵ؛ ڕەش و سپی (بۆ دەشت و کێو لە کاتی دەمەو بەهاردا) ☰ خال ـ خال

**کەژاوە** / kejawe/: ناو. ١. سندووقی زل کە لە سەر پشتی بارمبەر دادەنرا و بنیادەمی تێدا سوار دەبوو ٢. دارێ کە لە بن دیوارەوە ومبەر کاریتە دەدرێ ☰ ١. کجاوه ٢. ستون زیر بالار، بغل دیوار

**کەژتەنگ** / kejteng/: ئاوەڵناو. تووڕە؛ جاڕز ☰ عصبانی

**کەژک** / kejik/: ☚ کەژو

**کەژگ** / kejig/: ☚ کەژو

**کەژوان** / kejwan/: ☚ کەژەوان

**کەژوانی** / kejwanî/: ناو. کەژەوانی؛ شاخەوانی؛ ڕازەوانی ☰ کوهنوردی

**کەژۆ** / kejo/: ئاوەڵناو. ١. سپی پێست ٢. مەرەز زەرد (بزن) ☰ ١. پوست سفید ٢. کُرک زرد (بُز)

**کەژۆک**[1] / kejok/: ناو. ١. کەژ؛ ئاورێشمی خاو ٢. بەری گیایەکە لە لۆکە دەکا ☰ ١. ابریشم خام ٢. ثمر گیاهی شبیه پنبه

**کەژۆک**[2]: ئاوەڵناو. قیج؛ زۆر سپی ☰ بسیار سفید

**کەژۆکی** / kejokî/: ناو. ئارتریۆسکلرۆسیس؛ نەخۆشی توند بوونی دەمارە خوێنبەرەکان کە بە هۆی کەڵەکە بوونی چەوری و ماکی‌تر لە سەر دیواری ناوەوەیانەوە دروست دەبێ ☰ بیماری تصلُب شرایین

**کەژو** / kejû/: ناو. کەژ؛ کەژک؛ کەژگ؛ کەژی ☰ نوار پهن تنگەبند ستور

**کەژە** / keje/: ناو. ١. کز؛ وەرز؛ فەسڵی ساڵ ٢. جۆرێ چەکوچ کە فیلیان پێ لێدەخوڕێ ☰ ١. فصل سال ٢. چکش ویژەی فیل‌رانی

**کەژەسەر** / kejeser/: ناو. گیایەکە ☰ گیاهی است

**کەژەک**[1] / kejek/: ناو. مووی زەردی بزنە مەرەز ☰ کُرک زرد رنگ بُز

**کەژەک**[2]: ئاوەڵناو. سپی ئامال زەرد (گیانەوەر) ☰ سفید مایل به زرد (جانور)

**کەژەڵ**[1] / kejeł/: ناو. */سووکەڵە، مەجاز/* کەژاڵ؛ گراوی؛ دڵبەر ☰ معشوقه

**کەژەڵ**[2]: ئاوەڵناو. ١. سپی گوێ قاوەیی (بەز) ٢. کەوەی تاریک (بزن) ٣. ڕەش و سپی (ئاژەڵ) ☰ ١. سفید گوش قهوه‌ای (بُز) ٢. طوسی پر رنگ (بُز) ٣. سفید و سیاه (بُز و گوسفند)

**کەژەوان** / kejewan/: ناو. کەژوان؛ شاخەوان ☰ کوهنورد

**کەژەوانی** / kejewanî/: ناو. کەژوانی؛ شاخەوانی؛ ڕازەوانی ☰ کوهنوردی

**کەژەوە** / kejewe/: ناو. جلشین؛ کەژاو؛ قەوزە؛ قۆزەقورواق ☰ خزه

**کەژی**[1] / kejî/: ☚ کەژو

**کەژی**[2]: ئاوەڵناو. کێوی؛ وەحشی ☰ کوهی؛ وحشی

**کەژین** / kejîn/: ئاوەڵناو. ئاورێشمی؛ تەنراو لە ئاورێشم ☰ ابریشمی

**کەس**[1] / kes/: ناو. کێس؛ کەش: ١. مرۆڤ؛ مرۆ؛ بنیادەم؛ ئینسان ‹هەر کەس؛ هیچ کەس› ٢. */ئەدەبی/* یەکەی بژاردنی مرۆڤ ‹دوو کەس› ٣. کەس‌وکار؛ کریف؛ کریڤ؛ خزم و خوێش یان دۆستی نزیک ‹لەو شارەدا کەسێکی نەبوو› ٤. گەورە؛ سەرپەرشت ‹ئەو منالە بێ کەسە› ٥. */مەجاز/* پشت و پەنا؛ دالدە ‹کورد زۆر بێ کەسە› ☰

١. کس؛ شخص ٢. نفر ٣. خویش؛ قوم ۴. سرپرست ۵. پشت‌وپناه

⊡ **کەس لە کەس:** ڕەوتی حیساب پاک بوون و نەمانی قەرز ☰ بی حساب

**کەسمان لە کەس:** هەردوو لا بێ‌حیساب ☰ بی حساب شدیم

**کەس**[2]: ئاوەڵکار. چکەس؛ هیچکەس ‹من ڕۆیشتم، بەلام کەس نەهاتبوو؛ ـ لێرە کێ دەناسی؟ ـ کەس (واتا: هیچکەس ناناسم)› ☰ هیچکس

**کەسا**[1] / kesa/: ☜ **کیسەڵ**

**کەسا**[2]: ئاوەڵناو. [کینایە] کورتەبنەی قەڵەو ☰ تُپلی

**کەسابەت** / kesabet/: ☜ **کاروکاسبی**

**کەساپ** / kesap/: ناو. کۆسپ؛ زەمەند و دارستانی چوغور ☰ راه دشوار جنگلی

**کەسات** / kesat/: ئاوەڵناو. بێ‌بڕەو؛ بێ‌ڕەواج ☰ کساد؛ بی‌رونق

**کەساخ** / kesax/: ناو. ١. ☜ **کەزاخ** ٢. ☜ **کەزاخە**

**کەساخە** / kesaxe/: ناو. کەساخ؛ جاش باڵتە ☰ قبای کوتاه

**کەساد** / kesad/: ئاوەڵناو. مەرۆ؛ نەفت؛ بێ‌بڕەو؛ ناڕەواج ☰ کساد

**کەساس** / kesas/: ئاوەڵناو. ١. کەسات؛ بێ‌بڕەو ٢. حاڵ‌پەرێشان؛ بێ‌سەروبەرە ☰ ١. کساد ٢. پریشان‌حال

**کەساسی** / kesasî/: ناو. ماڵەڤین؛ بێ‌بڕەوی ☰ کسادی

**کەسافەت** / kesafet/: ناو. پیسی؛ چلکنی ☰ پلیدی

**کەسان** / kesan/: ناو. نەفەرات؛ چەند کەس ☰ کسان

**کەساندن** / kesandin/: چاوگ. ١. سەرپەرشتی کردن؛ مشوور لێ خواردن ٢. خاترجەم/ دڵنیا کردن ٣. کەسداندن؛ گۆشت وشک کردنەوە و دە مەشکە کردن بۆ زستان ☰ ١. سرپرستی کردن ٢. اطمینان دادن ٣. گوشت را برای زمستان خشک و در مشک کردن

**کەسایەتی** / kesayetî/: ناو. کەسێتی؛ کەسیەتی: ١. گەد، کردەوە، ئاکار یان شێوەی وا کە بکەوێتە بەرچاوی خەڵکەوە و ڕێزی لێ بگیرێت ‹خاوەن کەسایەتییەکی تایبەتە› ٢. کۆی تایبەتمەندییەکانی هەر کەسێ کە لە کەسانی‌تر جیای دەکاتەوە ‹کەسایەتی خۆت بناسە› ٣. دۆخی هەبوون بەپێی قانوون ‹کەسایەتی حقوقی› ٤. هەر یەکە لە قارەمانانی فیلم، چیرۆک یان شانۆیەک ‹کەسایەتی سەرەکی؛ کەسایەتی خراپ› ☰ ١تا۴. شخصیت

**کەسب** / kesb/: ناو. کسب؛ کسپ؛ کەسپ: ١. کاسبی؛ کسم ٢. پیشە؛ سنعات ☰ ١. کسابت ٢. صنعت

**کەسپ** / kesp/: ناو. ١. ☜ **کەسب** ٢. کۆسپ؛ لەمپەر؛ بەرگر ٣. کاری سەربان تەپاندنەوە ☰ ١. ☜ **کەسب** ٢. مانع سر راه ٣. عمل با پا کوبیدن پشت‌بام

**کەسپک** / kespik/: ناو. شەیتانۆکە؛ قەپۆشکە ☰ حلزون

**کەسپۆ** / kespo/: ناو. ناوکە خورما ☰ هستەی خُرما

**کەسپەر** / kesper/: ئاوەڵناو. ١. چاوشین ٢. چاوکاڵ ☰ ١. چشم سبز ٢. چشم زرد

**کەسپەرە** / kespere/: ناو. چوارپارە؛ جۆرێ ساچمەتفەنگی درشت ☰ نوعی ساچمەی درشت برای تفنگ ساچمەای

**کەست**[1] / kest/: ناو. کاری خراپ ☰ کار زشت

**کەست**[2]: ئاوەڵناو. گەست؛ ناشیرین؛ ناجوان ☰ بدگل؛ زشت

**کەستانە** / kestane/: ناو. شابەڕوو؛ شەمبەلووت؛ جۆرێ بەرووی خڕی پانکەڵەی تێکوڵ ڕەشی

ئامالْ سووورە 🇮🇷 شاەبلوط

**کەستک** / kestik/: ناو. کەستەک؛ کەسەک؛ سندە 🇮🇷 کلوخ

**کەستور** / kestur/: ناو. جۆرێ کووتاڵە 🇮🇷 نوعی پارچە

**کەستەک** / kestek/: ناو. ١. ☜ **کەستك** ٢. قورسە؛ کانزای دە قاڵب کراوی توندەوەبوو 🇮🇷 ١. ☜ **کەستك** ٢. شمش

**کەسخ** / kesx/: ناو. ١. کخس؛ خیسکە؛ خسکە ٢. ☜ **کەزاخ** 🇮🇷 ١. پیاز کاشتنی ٢. ☜ **کەزاخ**

**کەسخاندن** / kesxandin/: ☜ **کەزاختن**

**کەسدار** / kesdar/: ئاوەڵناو. خزمدار؛ بە کەس؛ کەس‌وکاردار 🇮🇷 دارای قوم و خویش و نزدیکان زیاد

**کەسداندن** / kesdandin/: چاوگ. کەساندن؛ هەڵگرتنی گۆشت لە پێستەدا بۆ زستان 🇮🇷 عمل نگهداری گوشت در چرم دباغی‌شدە برای زمستان

**کەسرەوان** / kesrewan/: ناو. شەدە و هەوری لێک‌هاڵاوی سەری خانمان 🇮🇷 روسری بافتەی زنانە

**کەسک**[1] / kesk/: ناو. کسک؛ سەوز؛ سەوزە؛ ڕەنگی گیا 🇮🇷 رنگ سبز

**کەسک**[2]: ئاوەڵناو. کسک؛ بە ڕەنگی سەوز 🇮🇷 سبز

**کەسکاتی** / keskatî/: ناو. کەسکایی؛ سەوزایی دەشت و دەر 🇮🇷 نمای سبز دشت

**کەسکاسۆر** / keskasor/: ☜ **کەسکەسور**

**کەسکان** / keskan/: ☜ **قەزوان**

**کەسکانکرۆژ** / keskank(i)roj/: ناو. مەلێکی بچووکە، ئەویندار شلکەقەزوانە 🇮🇷 پرندەای کوچک

**کەسکاو** / keskaw/: ناو. چێشتی سلْق 🇮🇷 نوعی آش

**کەسکایی** / keskayî/: ☜ **کەسکاتی**

**کەسکڕەنگی** / keskřengî/: ناو. سەوزی 🇮🇷 سبز رنگی

**کەسکوسۆر** / kesk û sor/: ☜ **کەسك‌وسور**

**کەسکوسور** / kesk û sûr/: ناو. کەسک‌وسۆر: ١. ☜ **کۆلکەزێڕینە** ٢. کەشک‌وسوور؛ سەوز و سووری تێکەڵاو 🇮🇷 ١. ☜ **کۆلکەزێڕینە** ٢. سبز و سرخ آمیختە

**کەسکون** / keskun/: ☜ **کەسکون**

**کەسکۆیی** / keskoyî/: ناو. ڕەنگی ئامالْ سەوز 🇮🇷 سبزفام

**کەسکون** / keskûn/: ئاوەڵناو. کسکون؛ کەسکون؛ کەسکین: ١. تیر؛ پرمایە؛ بەرانبەری کاڵ ‹چایەکی کەسکوون تێکە!› ٢. چێژەتوند ‹سرکەیەکی کەسکوونە› ٣. کاریگەر؛ کارتێکەر؛ کارکۆ ‹مشتێکی کەسکوونی تێ سرەواند!› ٤. *[کنایە]* تەڕدەماخ؛ کەیف‌خۆش 🇮🇷 ١. غلیظ ٢. تُندمزە ٣. کاری ۴. خوشحال

**کەسکە** / keske/: ناو. ١. شینکەی بەهاران ٢. *[مەجاز]* ژنی زمان‌درێژ 🇮🇷 ١. سبزەی بهاران ٢. زن زبان‌دراز

**کەسکەتاری** / kesketarî/: ناو. کەسکی تۆخ 🇮🇷 سبز تیرە

**کەسکەزەلال** / keskzelal/: ناو. کەسکی ئاچوخ 🇮🇷 سبز روشن

**کەس ـ کەس** / kes kes/: ☜ **کەس‌لەکەس**

**کەس‌کەسانێ**[1] / keskesanê/: ناو. تکا و کار پێک‌هێنان بۆ خزم و ئاشنا ‹با کەس‌کەسانێکی بۆ بکەین› 🇮🇷 پارتی‌بازی

**کەس‌کەسانێ**[2]: ☜ **کەس‌لەکەس**

**کەسکەسۆر** / keskesor/: ☜ **کۆلکەزێڕینە**

**کەسکەسور** / keskesûr/: ناو. کەسکاسۆر؛ کۆلکەزێڕینە 🇮🇷 رنگین‌کمان

**کەسکی** / keskî/: ناو. سەوزی؛ سەوزایی ڕەنگ 🇮🇷 سبزرنگی

**کەسکین** / keskîn/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **کەسکون** ٢. [کینایە] توندمەزاج ☰ ١. ☜ **کەسکون** ٢. تُندمزاج

**کەسکێن** / keskên/: ئاوەڵناو. ڕەنگ‌سەوز؛ بە ڕەنگی سەوز ☰ سبزرنگ

**کەس‌لەکەس** / keslekes/: ئاوەڵناو. کەس ـ کەس؛ هەرکە بۆخۆی؛ بێ‌سەروبەرە ☰ هرکی ـ هرکی

⊞ **کەس‌لەکەس بون**: کەس وە کەسەوە نەبوون؛ هەر کە بۆ خۆی بوون ☰ هرکی ـ هرکی بودن

**کەس وە کەسەوە نەبون**: ☜ **کەس‌لەکەس بون**

**کەس‌لەکەسی** / keslekesî/: ناو. تێکەوڵێکە؛ بەرهەڵدایی؛ بێ‌سەرەوبەرەیی ☰ بلبشو

**کەسم** / kesm/: ناو. تەحر؛ سەر و سیما؛ بیچم؛ شکڵ ☰ ریخت؛ قیافە

**کەسموک** / kesmûk/: ئاوەڵناو. هەمیشە تەنگەنەفەس و پشووسوار ☰ نفس‌تنگ

**کەسمە** / kesme/: ناو. ١. جۆرێ نانی چەور ٢. هەڵوای بە دۆشاو ٣. نەخۆشییەکی کەپۆی یەکسم ☰ ١. نوعی نان روغنی ٢. حلوای شیرەی انگور ٣. نوعی بیماری بینی ستور

**کەسمەبڕ** / kesmebiř/: ناو. وەردێنە؛ وەردانە ☰ نوردەی نانوایی

**کەسن** / kesn/: ئاوەڵناو. زشت؛ کرێت ☰ زشت

**کەسناو** / kesnaw/: ناو. سەرناو؛ نازناو ☰ لقب؛ کُنیه

**کەس‌نەبینە** / kesnebîne/: ئاوەڵناو. بەبێ دیتنی شتی گۆڕاوە (بۆ چەشنێ سەودا) ☰ معاوضەی نادیدە

**کەس‌نەدار** / kesnedar/: ئاوەڵناو. قات؛ ناوێرە؛ دەگمەن ☰ نادر

**کەس‌نەزان**[1] / kesnezan/: ناو. دارمبوق؛ ناوی دارێکی دڕکاوییە لە شۆڕە توو دەکا ☰ درختی است

**کەس‌نەزان**[2]: ئاوەڵناو. لێڵ؛ ناڕوون؛ نامەعلووم ☰ مُبهم

**کەس‌نەزان‌ئاوا** / kesnezan'awa/: ناو. شوێنی بە داب و دەستوور و بە زاکوون کە خەیاڵییە و لە واقیعدا ئەستەمە هەڵکەوێ ☰ ناکجاآباد

**کەسنەک** / kesnek/: ناو. گلۆت؛ سندەگڵ ☰ کلوخ

**کەس‌نەناس** / kesnenas/: ئاوەڵناو. ناناشنا؛ بێگانە؛ غەوارە؛ ناس‌نەکری ☰ ناشناس

**کەس‌نەویست** / kesnewîst/: ئاوەڵناو. نەگەویس؛ خوێنتاڵ لای هەموو کەس ☰ منفور

**کەس‌وکار** / kes û kar/: ناو. خزم و کەس؛ خزم و قەوم ☰ کس و کار

**کەسە** / kese/: ☜ **کیسەڵ**

**کەسەپشت** / kesepişt/: ☜ **کیسەڵ**

**کەسەخ** / kesex/: ناو. جۆرێ پاڵتاوی لە خوری، دەسکری خێزانی ماڵ ☰ نوعی پالتو پشمینەی دست‌دوز

**کەسەر** / keser/: ناو. خەم؛ خەفەت ☰ اندوە

⊞ **کەسەر هەڵدان**: ئاخ هەڵکێشان ☰ آه حسرت سر دادن

**کەسەک** / kesek/: ناو. ١. ☜ **کەستەک** ٢. قفڵ؛ گۆلە ٣. ئالقەڕێزی درگا ☰ ١. ☜ **کەستەک** ٢. قفل ٣. جاقُفلی در

**کەسەڵ** / kesel/: ☜ **کیسەڵ**

**کەسها** / kesha/: ناو. پرزەی بنی سەلکە پیاز ☰ تە پیاز

**کەسی** / kesî/: ئاوەڵناو. کەسین؛ خۆیی؛ تایبەت بە بنیادەمێکەوە ☰ شخصی؛ خصوصی

**کەسیرە** / kesîre/: ئاوەڵناو. تەزیو لە سەرمان ‹وەکوو کەوێکی کەسیرە/ سەرم بگرە و/ لە ژووری گەرمی مەمانتا..../ لە پیرێتیم بشارەوە «شێرکۆ»› ☰ کرخیدە از سرما

**کەسیف** / kesîf/: ئاوەڵناو. ١. پیس؛ چڵکن ٢. ناکەس؛ نامەرد ☰ ١. کثیف ٢. نامرد؛ بدجنس

**کەسین / kesîn/:** ☜ **کەسی**

**کەسیەتی / keysetî/:** ☜ **کەسایەتی**

**کەسێتی / kesêtî/:** ☜ **کەسایەتی**

**کەش[1] / keş/:** ناو. ١. شەی عەرز؛ تەڕایی لەباری زەوی کە دەخلی پێ بڕوێ ٢. پەڵەهەوری بە بارشت ٣. کەژ؛ چیا ‹سا با ڕاگەی چۆل بگیرمێ نە وەر/ تەی کەرمێ هەردان کەش و کۆ و کەمەر «سەیدی»› ٤. بن باخەڵ ٥. ئەستێرەیەکی گەڕۆکی زۆر بەتیشکە ٦. کۆش؛ سەر هەردوو ڕان ٧. کار و ڕەوتی تێکشانی تیر لە ئامانج ٨. ڕاکێشی؛ چۆنیەتی ڕاکێشان ٩. چلۆنایەتی هەوا ‹کەش گەرمە› ١٠. کەس؛ بنیادەم ١١. ئەو پارچە زیادەی جلدوور دەیداتەوە ١٢. ولسات و ئاژەڵی نێر کە بۆ تۆم لێ گرتنەوە ڕادەگیرێ ☰ ١. نمِ زمین کە غلە را برویاند ٢. قطعە ابر بارانزا ٣. کوە ۴. زیربغل ۵. ستارەای درخشان ۶ روی هردو ران ۷. انحراف تیر از هدف ۸. جاذبە ۹. وضع هوا ۱۰. کس؛ شخص ۱۱. اضافە پارچەای کە خیاط پس میدهد ۱۲. حیوان نر کە برای تخمکشی نگهداری میشود

⊡ **کەش بوون:** لەبار بوون بۆ ڕوان ‹زەوییەکە کەشی هەیە، دەروێنێ› ☰ مناسب کشت بودن

**کەش دانەوە:** بە تیر و تەسەلی ڕوان و گەشە سەندن (ئەمام و هەر چێندراوێ) ☰ رشد و نمو کردن

**کەش هاتن:** ١. پندر بوونەوەی زەوی پاش ئاو داشتن ٢. درێژ بوونەوە بە هۆی کشاندن ☰ ١. آمادە شدن زمین آبیاری شدە برای شخم ٢. کش آمدن در اثر کشیدن

**کەش هاتنەوە:** لە کەشدا بوون؛ پندر بوونەوەی زەوی ئاودراو ☰ آمادە شدن زمین پس از آبیاری برای شخم

**لە کەشدا بوون:** ☜ **کەش هاتنەوە**

**ـ کەش[2]:** پاشەوشە. ـ کێش ‹جاکەش؛ سەرکەش› ☰ ـ کِش

**کەشار / keşar/:** ناو. کەنار؛ لێواری زەریا ☰ ساحل

**کەشاکەش / keşakeş/:** ☜ **کەشمەکەش**

**کەشان ـ کەشان / keşan keşan/:** ناوەلکار. ڕەوتی ڕاکێشان بە زەویدا ☰ کشان‌کشان

**کەشاو / keşaw/:** ناو. ١. کەشەو؛ چەکمەجە؛ جابەیەکی سەرباز لە نێو قەفەسە، کومید یان مێزدا کە دەروناو دەکا ٢. کاری ئاو لە زەوی نان بۆ ئاوەنیا ☰ ١. کشو ٢. آبیاری قبل از شخم و بذرافشانی

**کەشاوەرز / keşawerz/:** ناو. جووتیار؛ دەشتەوان؛ فەلا ☰ کشاورز

**کەشاوەرزی / keşawerzî/:** ناو. ١. وەرزێری؛ جووتیاری؛ پیشەی جووتیار ٢. کشتوکاڵ؛ کاری کێلان و بە دەست هێنانی داهات لە زەوی ☰ ١و٢. کشاورزی

**کەشتووش / keştûş/:** ☜ **کەشوتووش**

**کەشتەرا / keştera/:** ناو. ڕەندە؛ ڕنە ☰ رندە

**کەشتەنگ / keşteng/:** ناوەلناو. وەڕەز؛ جاڕز ☰ بیزار

**کەشتی / keştî/:** ناو. گەمی؛ گەمیە؛ گەمێ؛ سوماری؛ پاپۆڕ؛ ئامێری پێڕاگوێزی گەورەی سەر ئاو، بەتایبەت بە عەرشە، کابین، هەمار و هەموو ئامێرێکی تایبەتەوە بۆ کار و پشوودانی دەریاوانان و مسافران ☰ کشتی

**کەشتیڤان / keştîvan/:** ☜ **کەشتیەوان**

**کەشتیگەل / keştîgel/:** ناو. ١. کاروانە کەشتی ٢. هێزی دەریایی ☰ ١. کاروان کشتیها ٢. نیروی دریایی

**کەشتیلە / keştîle/:** ☜ **کەوچێز**

**کەشتیوان / keştîwan/:** ☜ **کەشتیەوان**

**کەشتیەوان / keşt(i)yewan/:** ناو. کەشتیڤان؛ کەشتیوان؛ پاپۆڕەوان؛ پاپۆڕوان؛ گەمیەوان؛ گەمیوان؛ گەمێوان؛ ناخودا؛ زریڤان؛ زرێوان؛

ئەوەی کە کەشتی داژوێ ☰ کشتیبان؛ ناخدا

**کەشتێکەسەرە / keştêkesere/:** ☜ **کەشکەسەرە**

**کەشتێڵە / keştêłe/:** ☜ **کەوچێز**

**کەشخە[1] / keşxe/:** ناو. فیس؛ دەعیە ☰ فیس؛ افاده

⊡ **کەشخە کردن:** کەشخەیی کردن؛ فیز کردن ‹باڵەخانەی پێش تەختەبەنگ/ سەوز و سوور ڕەنگ/ .../ بە سەر حەوشەی ناو گەڕەکا،/ ئەڕوانێت و کەشخە ئەکا! «شێرکۆ»› ☰ افاده فروختن

**کەشخە[2]:** ئاوەڵناو. نەرمەنیشک؛ لهەڤ؛ قۆز؛ ڕێک و جوان و لەبەرچاو ☰ شیک

**کەشخەیی / keşxeyî/:** ناو. ١. ڕێک و لەبەرچاوی ٢. *[کنایه]* فیز و دەعیە ☰ ١. شیکی ٢. تکبُّر

**کەشف[1] / keşf/:** ناو. کەراماتی شێخان ☰ کرامت اولیا

**کەشف[2]:** ئاوەڵناو. ئاشکرا؛ خۆیا ☰ آشکار

**کەشک[1] / keşk/:** ناو. ١. شیرێژی بە تەڕی گوشراوی وشکەوەکراو ٢. سپی؛ چەرمگ؛ چەرموو ٣. ☜ **کەشکەزرانی** ٤. جومگەی دەست و پا ☰ ١. کشک ٢. سفید ٣. ☜ **کەشکەزرانی** ۴. مُچ دست و پا

⊡ **کەشک نانەوە** ١. ناوی یارییەکی لاوانە ٢. *[پلار]* زۆر دڵەودوا بوون و لە ترسان هیچ نەگوتن ☰ ١. از بازی‌های جوانان ٢. نگران بودن و دم نزدن

**کەشکی خۆ نانەوە** *[کنایه]* بار سووک بوون؛ حەسانەوە ☰ خر از پل گذشتن

**کەشک[2]:** ئاوەڵناو. بێ‌سەرومڕ؛ مفت؛ بێ‌بایەخ ☰ کشک؛ پووچ

**کەشکانا / keşkana/:** دۆعا. خۆزیا؛ بریا؛ کاشکا ☰ ای کاش

**کەشکاو / keşkaw/:** ناو. دۆکەشک ☰ دوغ کشک

**کەشکپا / keşkpa/:** ☜ **کەشکەزرانی**

**کەشکوسوور / keşk û sûr/:** ☜ **کەسك‌وسوور–٢**

**کەشکۆل / keşkol/:** ☜ **کەشکۆڵ**

**کەشکۆڵ / keşkoł/:** ناو. کەشکۆل: ١. فینجانی فەخفووری ٢. قاپێلکی میوەیەکە، دەروێشان دەسگرەی زەنجیری تێ دەخەن و سواڵی پێوە دەکەن ٣. بەرمووری زارۆکان ٤. دەفتەری بیرەوەری و شیعران ٥. نەخشێکە لە جاجم و بەرماڵدا ☰ ١. فنجان چینی ٢. کشکول درویش ٣. گردنبند کودکان ۴. دفتر شعر و خاطرات ۵. نقشی در جاجیم و جانماز

**کەشکە / keşke/:** ناو. ١. پووکاوڵە؛ چەمبۆڵە ٢. چڵم؛ ئاوی خەستی کەپۆ ٣. دۆخوای دۆکەشک ☰ ١. ام ٢. خلم ٣. نوعی آش

**کەشکەئەژنۆ / keşke'ejno/:** ناو. سەرچۆک ☰ کشکک زانو

**کەشکەبەڕۆنە / keşkebeřone/:** ناو. سیراجێ کە هێندێ ڕۆنی تێکەڵ دەکەن و ئەوسا دەیکەنە کەشک ☰ نوعی کشک

**کەشکەخۆرە / keşkexore/:** ناو. مەلێکی سپی و ڕەشە، مەشهوورە کە خواردنی هەر ئێسقانە، یان گۆشتێکی وای پێوە نییە و هەر پێشەیە! ☰ پرنده‌ای سفید و سیاه که گویا فقط استخوان خورد یا شاید استخوانی است و گوشت چندانی ندارد!

**کەشکەڕە / keşkere/:** ناو. قشقەڕە ☰ زاغی

**کەشکەزرانی / keşkez(i)ranî/:** ناو. کاسەئەژنۆ؛ کاسەزرانی؛ کاسەی ئەژنۆ؛ کاسەی زرانی؛ کوتیل؛ کوننەزرانی؛ کەشکەوژنگ؛ کەشک؛ کەشکپا؛ کەشکەزەنگۆڵ؛ کەشکەژنۆ؛ کەشکەک؛ کەشگەک؛ پێشەزرانی ☰ کاسەی زانو

**کەشکەزەنگۆڵ / keşkezengoł/:** ☜ **کەشکەزرانی**

**کەشکەژنۆ / keşkejno/:** ☜ **کەشکەزرانی**

**کەشکەسەرە / keşkesere/:** ناو. کەشتێکەسەرە: ١. کەچکەقوڵە؛ کەوچکەقوڵە؛ بەچکەبۆقی هێشتا لە پێستی ساوایی دەرنەهاتوو ٢. خەمەگرۆ؛

سەرمازەڵە؛ جۆرێ مارمێلکە 🇮🇷 ١. نوزاد قورباغه ٢. چلپاسه؛ نوعی مارمولک

**کەشکەشان** / keşkeşan/: ☜ **کاکەشان**

**کەشکەک** / keşkek/: ناو. ١. هەریسە؛ حەلیم؛ چێشتی گەنمەکوتاو ٢. ☜ **کەشکەزرانی** 🇮🇷 ١. آش حلیم ٢. ☜ **کەشکەزرانی**

**کەشکەڵان** / keşkełan/: ☜ **کاکەشان**

**کەشکەوژنگ** / keşkew(i)jing/: ☜ **کەشکەزرانی**

**کەشکین** / keşkîn/: ناو. ١. دۆکەشک ٢. چێشتی کەشکان 🇮🇷 ١. دوغ کشک ٢. آش کشک

**کەشگە** / keşge/: ناو. کەلاژدم؛ دووپشک؛ دمارەکۆڵ 🇮🇷 عقرب

**کەشگەک** / keşgek/: ☜ **کەشکەزرانی**

**کەشم** / keşm/: لێل. ← **کەشمونەشم**

**کەشماکەش** / keşmakeş/: ☜ **کەشمەکەش**

**کەشمان** / keşman/: ناو. کایەی تەناف کێشان لە دوو لاوە 🇮🇷 مسابقەی طناب‌کشی

▣ **کەشمان هاتن:** درێژ بوونەوە بە هۆی کێشان 🇮🇷 کش آمدن در اثر کشیدن

**کەشمونەشم** / keşm û neşm/: ناو. ناز و خەمزە ‹وەکوو کەشمونەشمی بووکێ/ وەک ڕەنگ و بۆنی گوڵووکێ «هێمن»› 🇮🇷 ناز و غمزه

**کەشموون** / keşmûn/: ناو. هێشووە بەرسیلەی لە دار وەریو، بەر لە گەیشتن 🇮🇷 غورەی از مو ریخته

**کەشمەکەش** / keşmekeş/: ناو. کەشاکەش؛ کەشماکەش؛ کێشماکێش: ١. قەرقەشە؛ خەرخەشە؛ کێشەوبەرە؛ گێرەوکێشە؛ نێوان ناخۆشی دەگەڵ شەڕ و زەنا و چەقەدا ٢. کاری کێشرانی هاوکات لە دوو یان چەند لاوە ‹ئەو دێ دەبا بە کەشمەکەش، ئەم دێ دەبا بە لوتف/ ئەو شاهی دلبەرە، نە شەهەنشاهی دلدەرە «نالی»› 🇮🇷 ١و٢. کشمکش؛ کشاکش

**کەشناسی** / keşnasî/: ناو. هەواناسی؛ هەواشناسی 🇮🇷 هواشناسی

**کەش‌وتووش** / keş û tûş/: ئاوەڵناو. کەش‌تووش؛ قیلەوقانج 🇮🇷 أریب

**کەشوشک** / keşuşk/: ☜ **کەشۆیلە**

**کەشوشکە** / keşuşke/: ☜ **کەشۆیلە**

**کەش‌وفش** / keş û fiş/: ناو. *[پلار]* کەش‌وقنگ؛ فیز و ئیفادە ‹هەر مەجلیسێ بچێ، بە کەش‌وفش ئەچێتە ژوور› 🇮🇷 فیس و افاده

**کەش‌وقنگ** / keş û qing/: ☜ **کەش‌وفش**

**کەشوێلە** / keşwêle/: ☜ **کەشۆیلە**

**کەشۆل** / keşol/: ناو. گاگۆز؛ پۆلکە؛ شوقل 🇮🇷 نخود فرنگی

**کەشۆیلە** / keşoyle/: ناو. کەشوشک؛ کەشوشکە؛ کەشوێلە؛ خەزایی؛ عایلەمەن 🇮🇷 سار صورتی

**کەشە** / keşe/: ناو. ١. قەشە؛ مەلای خاچپەرستان ‹مەسیحی ئەگەر پرۆتستانت یان ئورتودۆکس با، دەبوایە کەشەی خۆی بۆ بێنن و کەشەی کاتۆلیک خۆی تێنەدەگەیاند! «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. تێلای لە دەستان خۆش و بێ گرێ ٣. *[مەجاز]* چووک؛ سیرەت؛ ئەندامی زایەندی نێرینە ٤. جار؛ چەل ‹یە کەشە لاتی، چوار کەشە ماتی! «مەسەل»› ٥. قاشە ماسی ٦. نیشانەی «~» 🇮🇷 ١. کشیش ٢. چوبدست هموار ٣. آلت تناسلی نر ۴. بار؛ دفعه ۵. نوعی ماهی ۶. علامت مد

**کەشەف** / keşef/: ناو. سینی درێژووکە بۆ پیالە و ئیستیکان 🇮🇷 سینی کوچک بیضی شکل

**کەشەنگ** / keşeng/: ئاوەڵناو. شەکەت؛ ماندوو؛ مانگ 🇮🇷 خسته و کوفته

**کەشەو** / keşew/: ☜ **کەشاو ـ١**

**کەشەور** / keşewir/: ☜ **کەشەهەور**

**کەشەهەور** / keşehewr/: ناو. کەشەور؛ هەوری تەنک و پەڵە ـ پەڵە بە ئاسمانەوە 🇮🇷 لکەهای ابر

**کەشیدە** / keşîde/: ناو. ١. بزاوی بلند کردنی

دەنگ لە سەر پیت ٢. پێچی زەردی حاجی ‹مام حاجی ئەتۆش لابە کەشیدەی فڕ و فێڵت/ تیر نابێ بە هیچ چشتێ یەقین دیدەی لێلت «قانع»› ٣. زللە؛ شەقەزیلە ٓ ١. علامت مد بر حروف ٢. عمامەی زرد حاجیان ٣. سیلی

**کەشیش**[1] / **keşîş**/: ناو. ١. کەشەی خاچپەرەستان ٢. *[پلار]* دەویت؛ گەواد ٓ ١. کشیش ٢. جاکش

**کەشیش**[2]: ئاوەڵناو. کورتەبالا؛ باواقۆرەت ٓ کوتوله

**کەشینە** / **keşîne**/: ناو. جۆرێ ماسی کە لە ئاوی شیریندا دەژی ٓ نوعی ماهی آب شیرین

**کەعبە** / **ke'be**/: ناو. کابە؛ ڕووگەی موسوڵمانان ٓ کعبه

▣ **کەعبە کەچ نەبوون:** *[کیایە]* هیچ نەقەومان؛ شتێکی ناوازە نەبوون ‹با جارێ تۆش بی بۆ لامان، خۆ کەعبە کەچ نابێ› ٓ آسمان بە زمین نیامدن

**کەعن** / **ke'n**/: ☜ **کۆن**[2]

**کەف** / **kef**/: ناو. ١. تەخت؛ ژبر؛ تەرک؛ تەختەسەرا؛ ڕووبەری ساف کە لە سەر ئەرز و بەرامبەر بە ئاسمان و میچە ‹کەفی دیو› ٢. لەپ؛ لمم؛ شەپ؛ لەواسە؛ بەر؛ چەپ؛ بەشی ڕاست و سافی تاقمێ لە ئەندامان ‹کەفی پێ› ٣. پەنجە؛ لەپ؛ ناولەپ ‹ساقی سا دەخیل جام مەی وە کەف/ دەروێش! ئامانەن کەفێ نە ڕووی دەف «مەولەوی»› ٤. کەو؛ کەفەژیلکە؛ کۆمایەک لە تۆقلەی وردیلەی گاز لە تراوێکدا ‹کەفی سابوون› ٥. ئەو ماکەی بۆتە بلقی سەر تراو ‹کەفی سەر ئاوجۆ› ٦. پەراوێز؛ کەنارە ٓ ١تا٥. کف ٦. کنارە؛ حاشیه

▣ **کەفی دەریا:** ١. دەرمانێکە ٢. هەور؛ شتێکی شل و کون‌ـکونە لە دەریاوە دەهێنرێ، سابوونی لێ دەدەن و دم و چاوی پێ دەشۆن ٓ ١. کف دریا؛ دارویی است ٢. اسفنج؛ ابر مُرده

▣ **کەف پرژاندن:** کەفچاندن: ١. کەف هێنانە سەر لێو ٢. کەف لە شەپۆل جیا بوونەوە ٓ ١. کف بر لب آوردن ٢. کف انداختن موج

**کەف چەڕاندن:** ١. کەف دانە دەرەوە ٢. *[پلار]* بە تووڕەییەوە قسە کردن ٓ ١. کف پراکندن ٢. با عصبانیت سخن گفتن

**کەف کردن:** ١. کەف هەڵخستن؛ تۆقلەی وردیلەی گاز دروست بوون ‹دۆەکە کەفی کردووە› ٢. *[پلار]* زۆر تامەزرۆ بوون ٓ ١و٢. کف کردن

**کەف لێ دان:** خواردن بێ ئیجازەی خاوەن ٓ ناخُنک زدن

**کەف هەڵغراندن:** *[مەجاز]* زۆر تووڕە بوون ٓ سخت عصبانی شدن

**کەف هەڵخستن:** ☜ **کەف کردن ـ١**

**کەفارە** / **kefare**/: ☜ **کەفارەت**

**کەفارەت** / **kefaret**/: ناو. کەفارە: ١. تۆڵەی تاوان ٢. شوومی؛ جووتقۆشەیی ٓ ١. کفّاره ٢. بدیُمنی

▣ **کەفارەت دان:** بەخشین بۆ بەخشرانی تاوان ٓ کفّاره دادن

**کەفارەتدار** / **kefaretdar**/: ☜ **کەفارەتی**

**کەفارەتی** / **kefaretî**/: ئاوەڵناو. کەفارەتدار؛ بێفەڕ؛ شووم ٓ بدیُمن

**کەفاک** / **kefak**/: ناو. تەپڵەسەر؛ تۆقەسەر ‹دای بە کەفاکیا دارانیدییەوە!› ٓ تارک سر

**کەفاڵ** / **kefal**/: ناو. چەشنێ ماسی خۆراکی کە لە کەرخاو و زەلکاوی سوێردا دەژی، جەستەی درێژە و گەدەی وەک سیکەتۆرەی مەلانە ٓ ماهی کفال

**کەفاندن** / **kefandin**/: چاوگ. ١. دروونەوەی دەوری جلک ٢. پەراوێز گرتن ٓ ١. سجاف دوختن ٢. حاشیه دوختن

**کەفاو** / **kefaw**/: ناو. کەفی سابوون، ئەسپۆن

یان... دەگەڵ ئاو ☰ کفابه

**کەفاوی** / kefawî/: ئاوەڵناو. کەفی؛ بە کەفەوە تلاو ‹دەستی کەفاوی› ☰ کف‌آلود

**کەف پرژێن** / kefpiřjên/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی شەپۆلاوێ کە کەف بڵاو دەکاتەوە ☰ ویژگی موجی که کف می‌پراکند

**• کەفت** / keft-/: ☜ ـ کەوت[٢]

**کەفتار** / keftar/: ☜ کەمتار

**کەفتارۆ** / keftaro/: ☜ کەمتار

**کەفتانی** / keftanî/: ناو. جۆرێ سەبیلەی کلک‌درێژ ☰ نوعی چُپُق دسته‌بلند

**کەفتگ** / keftig/: ☜ کەوتوو[١]

**کەفتن** / keftin/: ☜ کەوتن

**کەفتنەوە** / keft(i)newe/: ☜ کەوتنەوە

**کەفتورەفت** / keft û řeft/: ناو. کەوت‌ورەوت؛ کەندولەند؛ بان و خوار؛ باش و خراپ ڕوو دان لە ڕەوتێک، بەتایبەت لە ژیاندا ‹ژیان کەفت‌ورەفتی زۆرە› ☰ اُفت‌وخیز

**کەفتولەفت** / keft û left/: ناو. کەفتەلەفت: ١. دەمەقاڵە؛ شەڕەقسە ٢. تەقالا و کۆشش؛ هەوڵ و تەقالای ☰ ١. جَدَل ٢. تلاش

**کەفتو** / keftû/: ☜ کەوتوو[١]

**کەفتە**[١] / kefte/: ئاوەڵناو. ١. ☜ کەوتوو[١] ٢. قەڵشاو؛ تلیشیاگ ☰ ١. ☜ کەوتوو[١] ٢. شکافته

⊡ **کەفتە دان**: ڕەنج دان و چەوسانەوە ☰ زحمت کشیدن و آزار دیدن

**کەفتە** ـ[٢]: پێشوشە. کەوتوو؛ کەفتگ ‹کەفتەکار› ☰ اُفتاده

**کەفتەر** / kefter/: ☜ کۆتر[١]

**کەفتەکار** / keftekar/: ئاوەڵناو. لەکارکەوتوو ☰ از کار افتاده

**کەفتەلەفت** / kefteleft/: ☜ کەفت‌ولەفت

**کەفتەیی** / kefteyî/: ☜ کەوتوویی

**کەفتی** / keftî/: ☜ کەوتوو[١]

**کەفتیار** / keft(i)yar/: ☜ کەمتار

**کەفتیر** / keftîr/: ☜ کەوگیر

**کەفچ** / kefç/: ☜ کەفچە

**کەفچاندن** / kefçandin/: ☜ کەف پرژاندن

**کەفچڕ** / kefçiř/: ☜ کەفچەڕێن

**کەفچڕێن** / kefç(i)řên/: ☜ کەفچەڕێن

**کەفچک** / kefçik/: ☜ کەوچك

**کەفچە** / kefçe/: ئاوەڵناو. کەفچ؛ دەمخوار ☰ دهن‌کج

**کەفچەرێن** / kefçerên/: ئاوەڵناو. دەڤتووک؛ دۆخی کەسێ کە لە تووڕە بووندا کەف لە دەمی دەچرێنێ ☰ کف به دهان (از خشم)

**کەفچەڕ** / kefçeř/: ☜ کەفچەڕێن

**کەفچەڕێن** / kefçeřên/: ئاوەڵناو. کەفچڕ؛ کەفچڕێن؛ کەفچەڕ ‹هاوار و هاژەی کەفچەڕێنی چەم/ بۆ تەنیایی شەو لایەلایەی خەم «گۆران»› ☰ کف‌انداز

**کەفچی** / kefçî/: ☜ کەوچك

**کەفخوێ** / kefx(i)wê/: ☜ کەیخودا

**کەفخۆی** / kefxoy/: ☜ کەیخودا

**کەفدەڤ** / kefdev/: ناو. ١. ڕەوتی ئاو لە کەپۆ هاتن ٢. لیکاوی دەم ☰ ١. آبریزش بینی ٢. لعاب دهان

**کەفدەم** / kefdem/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* زۆربلێ و چەنەوەر ☰ وراج

**کەفر** / kefr/: ناو. کەڕا؛ شاخ؛ گاشەبەرد؛ تاش؛ بەردی ڕژد و بڵند ☰ صخره

**کەفرتاش** / kefrtaş/: ☜ کەڤرتاش

**کەفرتەراش** / kefrteraş/: ☜ کەڤرتاش

**کەفرێژ** / kefřêj/: ئاوەڵناو. کەفەرێژ؛ پڕاوپڕ ☰ لبریز

**کەفز** / kefz/: ناو. کەز؛ کەزی؛ کەژاو؛ کەفزە؛ کەفزەر؛ کەڤز؛ کەڤس؛ کووز؛ خورپەجنە؛

خورپەجندۆکە؛ قەبزە؛ قەوزە؛ قـۆزە؛ قۆزەقـڕواق؛ قەوزاق؛ قەوزاخ؛ قەوزەقورواق؛ گووبۆق؛ گـاوەک؛ ناوی گشتی ئەو ڕوەکانە وا زۆرتر لە جێی شـۆدار و تاریک یان لە ئاوی مەنددا دەڕوێن ◘ خزه

**کەفزە** / kefze/: ☜ **کەفز**

**کەفزەر** / kefzer/: ناو. ١. ☜ **کەفز** ٢. جله داربی ◘ ١. ☜ **کەفز** ٢. جُلوزغ

**کەفش** / kefş/: نـاو. ١. ☜ **کەوش ـ١** ٢. کـەش؛ بن‌باخەڵ ◘ ١. ☜ **کەوش ـ١** ٢. زیربغل

**کەفشۆ** / kefşo/: نـاو. شەمێلە و کـزنی کـولاو کـە ئەدرێ بە گا ◘ حبوب آب‌پز برای گاو

**کەفشـە** / kefşe/: ئاوەڵـناو. قـــژن؛ قژنەســـەر ◘ ژولیده‌مو

**کەفشیف** / kefşîf/: ☜ **کەفشیو**

**کەفشـیو** / kefşîw/: نـاو. کەفشـــیف؛ ســـوێنەی کەشک تێدا سـوونەوە ◘ ظـرف ویـژەی سـاییدن کشک

**کەفشێل** / kefşêl/: نـاو. ئاوێ کە لـە سـووچی دەم دێ لە نەخۆشی یان لە ئیشـتیای شـتێک ◘ آب لب‌ولوچه

**کەفک** / kef(i)k/: ناو. جۆرێ قووچەکەی جلـدروو کە دەناو لەپی دەگرن ◘ از وسایل خیاطی

**کەفکانی** / kefkanî/: ☜ **کەفرکانی**

**کەفکـەفۆک** / kefkefok/: نـاو. ئەسـپۆن؛ سـپۆن؛ سەونچک؛ گیاکەفە ◘ چوبک

**کەفگیر** / kefgîr/: ☜ **کەوگیر**

**کەفلەمە** / kefleme/: ☜ **کەپلەمە**

**کەفلە** / kefłe/: ناو. بەردەخوێ ◘ سنگ نمک

**کەفماڵ** / kefmał/: ناو. کـار و ڕەوتی بـە دەسـت داماڵین ◘ ماساژ

**کەفوکوڵ** / kef û kuł/: ناو. ١. کەفی سەر چێشت لە کاتی جۆشیندا ٢. *[مەجاز]* کینە و ڕق ٣. گـڕ و تین ‹کەفـوکولی سـەربەخۆیی› ◘ ١. کف مـایع در حال جوشیدن ٢. قهر و غضب ٣. شور و اشتیاق

⊡ **کـەفوکوڵ نیشـتنەوە/ دامرکـان:** ☜ **کفـت‌وکۆی شتێ دامرکان/ دامردن**

**کەفە** / kefe/: ناو. ئاسـنێکە دروومانکـار دەیکەنـە دەست بۆ پاڵ پێوە نانی شووژن ◘ آهن کف دست دوزنده برای هُل دادن سوزن

**کەفەرێژ** / keferêj/: ☜ **کەفرێژ**

**کەفەژیلکـە** / kefejîlke/: نـــاو. کەفەلوولکـــــە؛ چەرمەچەقالتە؛ گۆشتی چەقالتە ◘ گوشت شُل و پررگ

**کەفەسەر** / kefeser/: ئاوەڵناو. پڕ؛ لیپاولیپ ‹دەبەکە کەفەسەرە لە شیر› ◘ لبریز

**کەفەکـوڵێ** / kefekułê/: نـاو. ئـەو شـیرەی وردە بەردی سپی لە نێـو دەکـەن و لـە سـەر ئـاگری دادەنێن بۆ ئەوەی زووتر بکوڵـێ و هەڵـنەچێ ◘ شیری که برای جوشاندن سنگریزەی سفید در ظـرف آن می‌ریزند

**کەفەل** / kefel/: ناو. هێفەل؛ کەفەڵ؛ لاڕان؛ سمت ◘ کفل؛ باسن

**کەفەلوولکە** / kefelûlke/: ☜ **کەفەژیلکە**

**کەفەڵ** / kefeł/: ناو. ١. سمتی یەکسم ٢. سمـت؛ لاقوون ◘ ١. کفل ٢. باسن

**کەفەڵۆک** / kefełok/: ☜ **کەفەڵووک**

**کەفـەڵـووک** / kefełûk/: ئاوەڵـناو. کەفەڵـــۆک؛ کەفەڵووکە؛ کون ـ کون؛ کونا ـ کونا؛ فشەڵ؛ فشۆڵ؛ گل؛ فشەڵۆک؛ فشەڵە؛ پفەڵ؛ تل؛ خل؛ ولولـین؛ بە کون و هولۆلی زۆرەوە ◘ مُتخلخل

**کەفەڵووکە** / kefełûke/: ☜ **کەفەڵووک**

**کەفەن** / kefen/: نـاو. ١. کفـن؛ جلکـی مـردوو ‹منیش لـە ئەلحـەد سـەرم دەرارم/ داد بکـەم هـاوار کەفەن کی سینی؟ «شامی»› ٢. *[کینایە]* شـتی زۆر چەرمگ ◘ ١. کفن ٢. شیء بسیار سفید

**کەفەن‌دز** / kefendiz/: ☜ **کفن دز ـ١و٢**

**کەفی** / kefî/: ناو. کەڤتک؛ کەفیک؛ کەفیە؛ دەسماڵ؛ دەسەسڕ ☰ دستمال

**کەفیک** / kefîk/: ☜ **کەفی**

**کەفیل** / kefîl/: ناو. ١. کەفیڵ؛ دەستەبەر؛ زامن ٢. سەرپەرست ☰ ١. ضامن ٢. سرپرست

**کەفیۆک** / kefyok/: ناو. دەسەسڕی بچووک ☰ دستمال کوچک

**کەفیە** / kefye/: ☜ **کەفی**

**کەفیڵ** / kefêł/: ☜ **کەفیل ـ١**

**کەڤ** / kev/: ناو. ١. ☜ **کەو ـ١** ٢. کەللە بێژنگ و دەف و... ☰ ١. ☜ **کەو ـ١** ٢. چنبرەی غربال و دف و...

**کەڤا** / keva/: ناو. ورتکە نانی تەنک، کە بۆ چینەی باڵندەی دەرێژن ☰ ریزەنانی کە برای چینەی پرندگان می‌ریزند

**کەڤار** / kevar/: ☜ **کەوار**

**کەڤارک** / kevarik/: ☜ **کارگ ـ١**

**کەڤاشتن** / kevaştin/: چاوگ. کەتاندن؛ ورد ـ ورد قرتاندن ☰ قطعه ـ قطعه کردن

**کەڤاڵ** / keval/: ناو. دەستەیەکی پچووک لە مێگەل ☰ بخش کوچکی از گله

**کەڤان** / kevan/: ☜ **کەوان**

**کەڤاندن** / kevandin/: ☜ **کەواندن**

**کەڤانژەن** / kevanjen/: ناو. هەلاج؛ کەسێ کە کولکە بە کەڤان شی دەکاتەوە ☰ پنبەزن

**کەڤانۆک** / kevanok/: ناو. تاقی سەر دەروازە ☰ تاق سردر

**کەڤانە** / kevane/: ناو. ١. کەوانە؛ کەمانە؛ ئەوی وەکوو کەوان وایە ٢. *[کینایە]* تاقی پرد و شتی تر ☰ ١. کمانە ٢. طاق پُل و امثال آن

**کەڤانی** / kevanî/: ☜ **کابان**

**کەڤتار**[1] / kevtar/: ☜ **کەمتار**

**کەڤتار**[2]: ئاوەڵناو. *[پەلار]* ١. زورهان؛ زۆر پیر و لەکارکەوتە ٢. چاخی وا کە لە بەر پرگۆشتی بە سەبرۆکە دەڕوا ☰ ١. ازکارافتادە ٢. چاقی کە از فرط سنگینی آرام قدم بردارد

**کەڤتک** / kevtik/: ناو. ١. ☜ **کەفی** ٢. کوفیە؛ جۆرێ سەرپۆشی ژنان ☰ ١. ☜ **کەفی** ٢. نوعی روسری

**کەڤجیرک** / kevcîrik/: ناو. پۆڕ؛ باڵندەیەکە خاڵ‌ـخاڵ، لە کەو زلتر ☰ پرندەای است

**کەڤچ**[1] / kevç/: ☜ **کەوچك**

**کەڤچ**[2]: ئاوەڵناو. خوار؛ چەفت ☰ کج

**کەڤچی** / kevçî/: ناو. ١. ☜ **کەوچك** ٢. چەوتی ☰ ١. ☜ **کەوچك** ٢. کجی

**کەڤر** / kevr/: ناو. ١. کەمر؛ بەرد؛ کوچک ٢. تاش؛ گاشەبەرد؛ بەردی زۆر زل ☰ ١. سنگ ٢. صخره

**کەڤرا** / kevra/: ☜ **کەربا**

**کەڤراندن** / kevrandin/: چاوگ. بەردەباران کردن؛ سەنگەسار کردن ☰ سنگسار کردن

**کەڤرتاش** / kevrtaş/: ناو. کەفرتاش؛ کەفرتەراش؛ کوچکتاش؛ بەردتراش ☰ سنگتراش

**کەڤرتراش** / kevrt(i)raş/: ناو. بەربڕ؛ تەوەنتاش؛ نەقار؛ بەردتاش؛ سەنگ‌تراش ☰ سنگتراش

**کەڤرکانی** / kevrkanî/: ناو. کەفکانی؛ قۆچەقانی؛ قەڵماس؛ قەڵماسک؛ بەرەقانی ☰ فلاخن

**کەڤرۆشک** / kevroşk/: ☜ **کەروێشك**

**کەڤرۆک** / kevrok/: ناو. کەڤرە؛ کەڤری؛ بەردەڵان ☰ سنگلاخ

**کەڤرە** / kevre/: ☜ **کەڤرۆك**

**کەڤری** / kevrî/: ☜ **کەڤرۆك**

**کەڤڕ** / kevir/: ناو. کوچک؛ بەرد؛ بەر ☰ سنگ

**کەڤز** / kevz/: ناو. ١. ☜ **کەفز** ٢. سەوزەڕەنگ ٣. بۆی گەن ☰ ١. ☜ **کەفز** ٢. سبز ٣. بوی گند

**کەڤزین** / kevzîn/: چاوگ. بۆگەن بوون (وەک:

ئاوی ڕاوەستاو) ☰ گندیدن (مانند: آب راکد)

**کەڤژال / kevjal/**: ناو. ١. ☜ **قرژانگ** ٢. چەخماخی تفەنگ ☰ ١. ☜ **قرژانگ** ٢. چخماق تُفنگ

**کەڤس / kevs/**: ☜ **کەفز**

**کەڤشک / kevşik/**: ناو. قرێژی سەر؛ کرێژی سەر ☰ شورەی سر

**کەڤک / kev(i)k/**: ناو. ١. بۆسۆ؛ بۆنی پەمۆی سووتاو ٢. ☜ **کەوچك** ☰ ١. بوی پنبەی سوختە ٢. ☜ **کەوچك**

**کەڤگیر / kevgîr/**: ☜ **کەوگیر**

**کەڤل / kevl/**: ناو. ١. ☜ **کەوڵ ـ١** ٢. عابای تیسکن لە پێستە پەز و بەرخ ٣. کەتایی دەمی تیخ ☰ ١. ☜ **کەوڵ ـ١** ٢. پوستین ٣. شکستگی لبەی تیغ

⊡ **کەڤل کرن**: کەڤلاندن؛ کەوڵ کردن؛ پێست دارنینی حەیوان ☰ پوست کندن

**کەڤلاندن / kevlandin/**: چاوگ. کەڤل کرن؛ کەوڵ کردن ☰ پوست کندن

**کەڤلۆ / kevlo/**: ناو. تیخی کەت ☰ تیغ لبە شکستە

**کەڤن / kevn/**: ☜ **کۆن**[2]

**کەڤنار / kevnar/**: ☜ **کەڤنارا**

**کەڤنارا / kevnara/**: ئاوەڵناو. کەڤنار؛ کەونارا؛ دێرینە ☰ باستانی

**کەڤنارک / kevnarik/**: ناو. عەتیقە؛ شتی لەمێژینە و بەقیمەت ☰ عتیقە

**کەڤنسال / kevnsal/**: ئاوەڵناو. پیر؛ بە تەمەنداچوو ☰ پیر

**کەڤنک**[1] **/ kevnik/**: ناو. چارەکەی تەنکی سەری ژنان ☰ سرپوش نازک زنانە

**کەڤنک**[2]: ئاوەڵناو. شڕ و کۆن (جلک) ☰ مُندرس

**کەڤنکێ پیرێ / kevnkêpîrê/**: ناو. جۆلاتەنەی جاڵجاڵووکە ☰ تار عنکبوت

**کەڤنەپەرست / kevneperist/**: ☜ **کۆنەپەرست**

**کەڤنەژن / kevnejin/**: ناو. ١. پیرەژن؛ ژنی زۆر عومرکردوو ٢. کۆنەژن؛ ژنی پێشووی مێرد ☰ ١. پیرزن ٢. زن قبلی مرد

**کەڤنەشۆپ / kevneşop/**: ناو. ١. شوێنی پێی پێشینە ٢. [کینایە] چیرۆکی سەرگوروشتە ☰ ١. ردپای گذشتگان ٢. داستان گذشتگان

**کەڤنی / kevnî/**: ناو. جاڵجالووکە؛ پسپسەکۆڵە ☰ عنکبوت؛ تارتنک

**کەڤنین / kevnîn/**: ناو. شوێنەواری کەون ☰ آثار باستانی

**کەڤوک / kevuk/**: ☜ **کۆتر**[1]

**کەڤۆت / kevot/**: ☜ **کەیکف**

**کەڤۆک / kevok/**: ☜ **کۆتر**[1]

**کەڤۆکرک / kevokirk/**: ☜ **کۆترەباریکە**

**کەڤەر**[1] **/ kever/**: ناو. ١. بەندەن؛ قەدی کێو ٢. ☜ **کەوەر ـ١** ☰ ١. کمر کوه ٢. ☜ **کەوەر ـ١**

**کەڤەر**[2]: ئاوەڵناو. ١. سپی واش ٢. بەڵەک (بزن) ٣. گوێچکە پنۆک ـ پنۆک (بزن) ☰ ١. سپیدفام ٢. دورنگ (بز) ٣. گوش‌ابلق (بُز)

**کەڤەز / kevez/**: ئاوەڵناو. بەڵەک؛ پنۆک ـ پنۆک؛ چیل ـ چیل ☰ خالدار

**کەڤەژ / kevej/**: ناو. ١. تویخی پێست ٢. چۆنیەتی سووتانی پێست ☰ ١. لایەی بیرونی پوست ٢. سوزش پوست

**کەڤەل / kevel/**: ☜ **کەوڵ ـ١**

**کەڤەندەکۆ / kevendeko/**: ناو. [کینایە] عاسمان؛ ئاسمان ☰ آسمان

**کەڤی**[1] **/ kevî/**: ناو. ١. ڕنوو؛ کلێڵە؛ شاپە؛ شەپە؛ ڕنی ٢. چەمەرە؛ کەمە؛ کەوان (وەک: دەوری دەف و بێژنگ و...) ٣. لێواری دەفر ٤. قەراغ ئاو؛ کەنارەی ئاو ٥. تەختی لە سەر دانیشتن ٦. گیایەکە ☰ ١. بهمن ٢. حلقە؛ کمان ٣. لبەی ظرف

۴. ساحل ۵. تخت و کُرسی ویژەی نشستن ۶. گیاهی است

▣ **کەڤی ڕەش:** بەفرێ کە تا هاوین بە چیاوە مابێ ⇆ برف تا تابستان آب نشده

**کەڤی٢:** ☜ **کەوی٢**

**کەڤیز / kevîz/:** ☜ **کەویژ**

**کەڤیژ / kevîj/:** ☜ **کەویژ**

**کەڤیشتن / kevîştin/:** ناو. زیخەڵان؛ جێ‌ڕەڵم ⇆ ریگزار

**کەڤیلۆک / kevîlok/:** ناو. کەڤی؛ لێوارەی دەفر و ئامان ⇆ لبەی ظرف

**کەڤین / kevîn/:** ناوەڵناو. کەوئاسا؛ خاڵ‌لەڕووی پێکەوتوو ⇆ صورت خالدار زیبا

**کەڤینک / kevînik/:** ناو. شاشک؛ پێچی سەری پیاوان ⇆ دستار مردانه

**کەڤێلە / kevêle/:** ناو. کەویەبەفر؛ ڕنوو؛ ڕنی؛ شاپە؛ کلێلە ⇆ بهمن

**کەک / kek/:** ناو. ١. کاک؛ براگەورە ٢. وشەی حورمەت بۆ پیاو ٣. قێچ؛ کێچ ⇆ ١. داداش ٢. آقا ٣. کک

**کەکرە / kekre/:** ناو. کرژەڵە؛ تالگ؛ تالگە؛ تالک؛ تالگ؛ تاڵە؛ تاڵی؛ تاڵی تۆس؛ تاڵوو؛ تاڵوەتاڵە؛ گوڵ‌گۆچێلە؛ بنەگیایەکی ئالفییە دانەکانی تاڵە و زۆرتر لە لێواری مەزرای گەنمدا دەڕوێ ⇆ تلخه

**کەککە / kekke/:** ناو. *[منداڵانە]* کەکە؛ قەقە؛ نوقڵ و شیرینی ⇆ نُقل و شیرینی

**کەکلێ / keklê/:** ☜ **کەو-١**

**کەکە / keke/:** ☜ **کەککە**

**کەکەو / kekew/:** ☜ **کەیکف**

**کەگل / kegil/:** ناو. قوڕی سواغدان ⇆ کاهگل

**کەگە / kege/:** ناو. بزن ⇆ بُز

**کەگیر / kegîr/:** ناو. مووخل؛ پاڵوێنە ⇆ کفگیر

**کەڵ١ / kel/:** ناو. ١. چیا؛ کەژ؛ کۆ ‹لەو کەڵە دەنگەی ساز دێ، هەڵاڵە و زەمزەمە/ دەنگەی خۆش ئاواز دێ، لەو باخ و چەمە «گۆرانی»› ٢. بستوو؛ زینوو؛ گەردەنە ‹لە کەڵ دەرکەوتم بناسە دەنگم/ تۆزی غەریبی نیشتووە لە ڕەنگم «فولکلۆر»› ٣. قەڵشت؛ قەڵش ٤. هیمە؛ زەنگەتڵیش؛ بڕەدار ٥. پیشە؛ ئیش؛ کار ٦. کەڵک؛ بەهرە؛ فایدە ٧. پەزی شاخدار ٨. پەچەی پەز لە دەشت ٩. کوڵ؛ ڕەوتی جۆشین ١٠. توێژەمار ١١. بریقە؛ وریشە ١٢. شەپۆلی چەم؛ پێلی ڕووبار ١٣. شکستی ئەندام ١٤. جەڕاح؛ شکستەبەند ١٥. ماڵ؛ خانوو ١٦. ☜ **کەڵ١-٣** ⇆ ١. کوه ٢. گردنه ٣. شکاف ۴. قطعەی هیزم ۵. کار ۶. بهره؛ فایده ۷. گوسفند شاخدار ۸. استراحتگاه گله در دشت ۹. جوشش؛ حالت جوشیدن ۱۰. پوست افتادەی مار ۱۱. درخشش ۱۲. موج رودخانه ۱۳. شکستگی اندام ۱۴. شکستەبند ۱۵. خانه ۱۶. ☜ **کەڵ١-٣**

▣ **کەڵ دان:** کەڵ دان؛ پەڕاندی گا لە چێڵ ⇆ انداختن گاو نر بر مادەی گُشن‌خواه

**کەڵ گرتن:** بە دەم کەسێکەوە بوون؛ دەستی کەسێ گرتن ⇆ دستگیری کردن

**کەڵ لە کەسێ خستن:** داوای یارمەتی لە کەسێ کردن ⇆ دست کمک به سوی کسی دراز کردن

**کەڵ لێ کەوتن/ کەفتن:** ئاتاجی یارمەتی کەسێک بوون ⇆ محتاج به کسی شدن

**کەڵ هاتن:** ١. بە کار هاتن؛ فایدەدان ٢. جۆش هاتن ‹ئاف کەڵ هاتییە› ⇆ ١. به کار آمدن ٢. جوش آمدن

**کەڵ٢:** ناوەڵناو. ١. داغ؛ داخ؛ بەتین ٢. کوڵ؛ نەبڕ ٣. گەڕ؛ کەچەڵ ٤. کەوتوو؛ پەڕیو؛ کەرت ‹تێشووەکە کەڵ بووە› ٥. ناتەواو؛ نیوەچڵ ‹مانگ کەڵ بووە› ٦. ددان‌شکاو یان کەوتوو ‹بە فیدای بالات بم بالا خەرتەلە/ هیچ عەیبت نییە، دانێکت کەلە «فولکلۆر»› ٧. شاخ‌شکاو ⇆ ١. داغ ٢. کُند ٣.

کچل ۴. لب‌پر ۵. ناقص ۶ دندان‌شکسته یا افتاده ۷. شاخ‌شکسته

◘ **کەل کردن**: ١. لێ‌کردنەوە؛ هێندێ لە شتێ برین ٢. نێوان تێ‌خستنی دیوارە و ددان و... ☰ ١. بریدن از چیزی ٢. شکاف انداختن در لبەی چیزی

**کەل**[٢]: لێل. ← **کەل‌وپەل**

**کەلا**[١] / kela/: ناو. ١. تیل؛ تیلە؛ مەرمەڕ؛ هەڵمات ٢. جگی درشت کە دە بازیدا بە دەس کایەکەرەوە دەمێنێ و نادۆڕێنرێ ٣. *[کینایە]* هەمەکارە ☰ ١. تیله ٢. قاب درشت کە در دست بازیگر می‌ماند ٣. همه‌کاره

◘ **خۆ لێ کردنە کەلا**: *[کینایە]* خۆ نواندن و بە خاوەن دەسەلات نیشان دان ‹کابرا لە هیچ خۆی لێ کردووین بە کەلا› ☰ خود را کاره‌ای قلمداد کردن

**کەلا**[٢]: ئاوەڵناو. کلا؛ دوورەپەرێز ☰ کناره‌گیر

**کەلائەنگوچک** / kela'enguçik/: ☜ **کەلانگوچك**

**کەلاپە** / kelape/: ناو. ساواری نیوەکولاو ☰ بلغور نیم‌پخته

**کەلات** / kelat/: ناو. کەلاتی؛ قەلات ☰ کلات

**کەلاتی** / kelatî/: ☜ **کەلات**

**کەلاج**[١] / kelac/: ناو. ئامێری گەیاندن و بەردانی هێزی موتور بۆ گیربوکس ☰ کلاچ

**کەلاج**[٢]: ئاوەڵناو. درۆزن و فێڵباز ☰ کَلّاش

**کەلاجگ** / kelacig/: ناو. کەللا ☰ قاپ درشت

**کەلاجۆیە** / kelacoye/: ئاوەڵناو. فریوباز؛ خاپینۆک ☰ فریبکار

**کەلاخ**[١] / kelax/: ناو. ١. تەرم؛ لاشەی مردوو ٢. قەل؛ قالاو ☰ ١. جنازه ٢. کلاغ

**کەلاخ**[٢]: ئاوەڵناو. کز و لاواز؛ دالگۆشت ☰ لاغر

**کەلار**[١] / kelar/: ناو. کەلاوە؛ کاولە؛ وێرانە؛ شوێنی وێران ☰ خرابه

**کەلار**[٢]: ئاوەڵناو. ١. لە سەر یەک داندراوی بلندبوو ٢. خاپوور؛ وێران ☰ ١. برهم انباشته ٢. ویران

**کەلارە** / kelare/: ناو. کلانە؛ کەللارە؛ دەفری لە ڕیخی وشکەوەکراو بۆ پشکەڵ تێ کردن ☰ ظرف از سرگین خشکیده

**کەلاری** / kelarî/: ناو. وێرانە؛ ویروونە؛ کەلاوە ☰ ویرانه

**کەلارێ** / kelarê/: ئاوەڵناو. کەلاوە؛ خاپوور ☰ ویران

**کەلاز** / kelaz/: ئاوەڵناو. *[شوورەیی]* بەفاڵ؛ بەکەڵ؛ نێرخواز (ماکەر و ماین و چێل) ☰ گُشن (ماده خر و مادیان و کبک)

**کەلاس** / kelas/: ☜ **کلاس**

**کەلاسونگ** / kelasung/: ناو. کەلاسینگ؛ کەلەسونگ؛ قۆچەقانی؛ بەرەقانی؛ کەهنیک ☰ فلاخن

**کەلاسینگ** / kelasîng/: ☜ **کەلاسونگ**

**کەلاش** / kelaş/: ناو. کەلاش: ١. جەندەکی حەیوانی مردارەوەبوو ٢. قەڵش؛ قەلاش ☰ ١. لاشه‌ی مُردار ٢. شکاف

**کەلاشتن** / kelaştin/: چاوگ. کەلاشتن؛ قەلاشتن ☰ شکافتن

**کەلاشتی** / kelaştî/: ئاوەڵناو. کەلاشتی؛ قەلاشتوو؛ قەڵشاو ☰ شکافته

**کەلاک** / kelak/: ناو. ١. کەلاش؛ جەندەکی مردارەوەبوو ‹هەتا وا بێ و دنیاکە لە گۆڕیان لا بێ، کاری ئاخوند و مەلاکان ـ کە وەک دالاش لە شوێن کەلاکان هەڵوەدان ـ ساز و تەیار و لەبارە! «هەژار، *چوار نامیلکە*»› ٢. مالات؛ پاتاڵ؛ ولسات ☰ ١. لاشه ٢. احشام

**کەلاکەل** / kelakel/: ناو. ١. قرچەی تاوسان؛ کوڵەکوڵی گەرمای هاوین ٢. کوڵی زۆری ئاو لە سەر ئاگر ☰ ١. گرمای شدید تابستان ٢. قُل‌ـقُل آب

بر آتش

**کـەلال** / kelal/: نـاو. ١. کـوێرەوەری؛ دەرد و زەحمەت ٢. گیا گەرچەک 🇮🇷 ١. رنج؛ مشقت ٢. گیاه کرچک

**کـەلام** / kelam/: نـاو. ١. فـەرموودە؛ ئاخـافتنی کەسی بە حورمەت ٢. قام؛ گـۆرانی ٣. بـە سـەر یەکـدا کـراوی گیـا و کلۆشـی وردنـەکراو 🇮🇷 ١. فرمایش ٢. ترانه ٣. تودەی گیاه و ساقەهـای غلـەی نکوبیده

◙ **کەلامە ئـالفـد** کۆمای ئالفی درواو لە خەرماندا. هەروەها: **کەلامە شەوەر؛ کەلامە وێنجە** 🇮🇷 تودەی علف درو شده در خرمن

**کەلامیٚ قەدیم:** ☜ **کەلامیٚ هۆمای**

**کەلامیٚ هۆمای:** کەلامیٚ قەدیم؛ کەلامیٚ هوومای؛ کەلووم هۆمای؛ کەلووم هوومای؛ فـەرموودەی خودا 🇮🇷 کلام خدا

**کەلامیٚ هومای:** ☜ **کەلامیٚ هۆمای**

**کـەلامێشـان** / kelamêşan/: نـاو. چـالان؛ چالـێن؛ ماتێن؛ هەلماتێن؛ پلان؛ کەللا دە قولکە خسـتن بۆ گەمە 🇮🇷 تیلەبازی

**کەلان**[1] / kelan/: ☜ **کوڵان**

**کەلان**[2]: ناوەلناو. جوانی تەواو؛ خوشیک و دەلال 🇮🇷 زیبای بی‌نقص

**کەلاندر** / kelandir/: ☜ **کەرەنتو**

**کەلاندن** / kelandin/: ☜ **کوڵاندن**

**کـەلانگوچک** / kelanguçik/: نـاو. کەلائـەنگوچک؛ کەلاو؛ ئەنگوچکـە سـۆرانی 🇮🇷 آستین بلند

**کەلانە** / kelane/: ناو. جـۆرە نانێکـە ناوەکـەی تـەرەپیاز و پیچـک و... تـیٚ دەکـەن و دە رۆنی کەرەی دەگەوزن 🇮🇷 کلانه

**کـەلاو** / kelaw/: نـاو. ١. ☜ **کـەلانگوچـک** ٢. شێلەگە؛ شەلیە؛ بڕگە لە جۆگـە ٣. ڕەوتی ڕژانی ئاو لە گۆل لە بەر پڕی ٤. شوێنی سەرڕێژ کردنی ئاوی ئەستێرک ‹کەلاوەکـەی فـرە تەسـکە› 🇮🇷 ١. ☜ **کەلانگوچك** ٢. بریدگی جـوی بـرای آبیـاری ٣. فرایند لبریز شدن آب استخر ٤. جای سرریز کردن آب استخر

◙ **کەلاو کردن:** هاتنە کەلاو؛ سەرڕێژ کردنی ئـاوی ئەستێرک ‹هەسێلـەکە کـەلاو ئـەکا› 🇮🇷 سـرریز کردن آب استخر

**هاتنە کەلاو:** ☜ **کەلاو کردن**

**کەلاوە** / kelawe/: ناو. ١. کاولـە؛ شـوێنی کـاول ‹چووکێک لە کەلاوەیەک لە بەر لابایێ/ دەیکۆلی بـە دنـدووکی، سـەری پاشـایێ «هـەژار؛ *چوارینـەکانی خەییام*»› ٢. چواردیـواری دانەپۆشـراو ٣. *[کینایە]* ماڵی فەقیرانە و ناخۆش ‹ئەم کەلاوە ئێمـەی تێـدا دەژیـن، سـەگی پـیٚ ڕازی نابـیٚ!› 🇮🇷 ١. ویرانـە ٢. چهاردیوار بی‌سقف ٣. خانەی مُحقّر

**کەلاوەشڕە** / kelaweş(i)ře/: ☜ **کەلاوەکۆن ـ٢**

**کەلاوەکۆن** / kelawekon/: ناو. ١. ماڵی ڕووخاو ٢. کەلاوەشڕە؛ ماڵی ڕووت و قووت ‹وەکوو جـیٚ پـیٚ بـەبیٚ بـان و دەر و دیـوارە کاشـانەم/ کەلاوەکۆنـی ویرانەم بە قەسری پادشا نـادەم «قـانع»› ٣. *[کینایە]* دنیـا؛ دنـیٚ؛ جیهـان 🇮🇷 ١. ویرانـە ٢. چهـاردیوار بی‌امکانات ٣. دُنیا

**کەلایانیٚ** / kelayanê/: ☜ **کەلایێن**

**کەلایی** / kelayî/: ناو. ١. خواری؛ لاری ٢. کـەلی؛ چۆنیەتی نێوان تیٚکـەوتن (وەک: لـە دیـوار، ددان و...) 🇮🇷 ١. کجی ٢. شکاف افتادگی (در دیـوار، ردیـف دندان‌ها و...)

**کـەلاییـن** / kelayîn/: نـاو. تیلـێن؛ هەلـماتێن؛ مەرمەڕێن؛ پلان؛ مێشان؛ ماتان 🇮🇷 تیلەبازی

**کەلایێن** / kelayên/: ناو. کـەلایانیٚ؛ کەللامێشـان؛ مێشان؛ مێشێن؛ پلان؛ هەلماتین؛ ماتان؛ مـاتێن؛ مەرمەڕێن 🇮🇷 تیلەبازی

**کەلبایە** / kelbaye/: ناو. کـەلبوت: ١. بـێفـەڕی؛ بێئاکاری ٢. بێشەرمی؛ بێئابڕوویی ٣. تەنبەڵی؛ تەوەزەلی ▪ ١. بداخلاقی ٢. بی‌شرمی ٣. تنبلی

**کەلبوت** / kelbut/: ☜ **کەلبایە**

**کەلبوڕی** / kelbuřî/: ناو. دۆخی هەڵچوون و ڕژانی تراو لە دەفر بـە هـۆی کـوڵانی بـە تەوژمـەوە ▪ چگونگی سر رفتن مایع روی آتش

**کەلبەتان** / kelbetan/: ناو. ١. ماشەی پەنگرگر ٢. گازی مێخ کێشـانەوە ▪ ١. آتش‌چـین ٢. گـازانبر میخ‌کشی

**کەلبەدوون** / kelbedûn/: ناو. عـەبای دەورگـیراوی بە زەڕی و دەزووی ڕەنگاوڕەنگ ▪ گلابتون

**کەلپ** / kelp/: نـاو. کەلم؛ ددانی پێشەوەی دڕنـدە ▪ دندان پیشین درنده

**کەلپاچا** / kelpaça/: ناوەڵـناو. کەلپاچـە؛ فرەخـۆر؛ تێرنەخۆر ▪ پُرخور

**کەلپاچە**[1] / kelpaçe/: ☜ **کەلەپاچە**[1]

**کەلپاچە**[2]: ☜ **کەلپاچا**

**کەلپاندن** / kelpandin/: چاوگ. چڵکن کـردن ▪ آلودن

**کەلپتاندن** / kelp(i)tandin/: چاوگ. تێکـوڵ لـێ کردنەوە ▪ پوست کندن

**کەلپتین** / kelp(i)tîn/: چاوگ. تێکوڵ لێ کرانـەوە ▪ پوست‌کنده شدن

**کەلپزا** / kelp(i)za/: ☜ **کەلپزە**

**کەلپزە** / kelp(i)ze/: ناوەڵـناو. کـەلپزا؛ بـێئابـڕوو؛ شەرمتکاو ▪ بی‌شرم

**کەلپەزی** / kelpezî/: ناو. خمخمۆک؛ خەمەگرۆ ▪ بُزمجه

**کەلپەک** / kelpek/: ☜ **کەپەك**

**کەلپەل** / kelpel/: ☜ **کەل‌وپەل**

**کەلپەی** / kelpey/: نـاو. سەگایەتی؛ کاری سـەگانە ▪ شیطنت

**کـەلپی** / kelpî/: نـاو. دێلەسـەگ؛ دەڵەسـەگ؛ سەگی مێچکە ▪ ماده سگ

**کەلپیک** / kelpîk/: نـاو. ئاجۆر؛ کولپیک؛ کـەرپووچ ▪ آجُر؛ خشت

**کەلتە** / kelte/: ☜ **کلدان**

**کەلج** / kelc/: ☜ **کلچێو**

**کەلخانـە** / kelxane/: نـاو. دووکـانی شـیرگـەر و تفەنگ‌ساز ▪ مغازەی اسلحه‌فروشی

**کـەلخۆت** / kelxot/: ناوەڵـناو. کۆلـۆس؛ کۆلـۆز؛ ددان‌کەوتوو ▪ بی‌دندان

**کەلخە** / kelxe/: ناو. ١. کەمچە؛ ماڵە ٢. ئەسکوێ؛ مەلاقە ▪ ١. ماله‌ی بنایی ٢. ملاقه

**کەلداشت** / keldaşt/: نـاو. کەڵک؛ فایـدە؛ فێـدە ▪ فایده

▣ **کەڵداشت پێوە نەمان**: لـە کەڵـک کـەوتن. هەروەها: **کەڵداشت پێوە نەهێشتن** ▪ بی‌مصـرف شدن

**کەلدان** / keldan/: ناو. جەڕاحی؛ شکستەبەندی ▪ شکسته‌بندی استخوان

**کەلـدایا** / keldaya/: نـاو. کەلـدایێ؛ کەلاکـەل؛ جەنگە ▪ عنفوان؛ گرماگرم

**کەلدایێ** / keldayê/: ☜ **کەلدایا**

**کەلدومان** / kelduman/: ناو. هەڵم؛ بۆق ▪ بُخار

**کەلدوەش** / keldweş/: ☜ **کەلدۆش**

**کەلدۆش** / keldoş/: نـاو. کەلدوەش؛ جۆرێ کولێرە کە لە بن ژیلەمۆ دەبرژێ ▪ نوعی گرده‌ی نان

**کەلژ** / kelj/: ناو. قـەدەم؛ هەڵـم؛ تـینی گـەرمای زۆری تاو ▪ هُرم

**کەلژە** / kelje/: ☜ **کەلەزە**

**کەلژین** / keljîn/: چاوگ. قـەدەم کـردن؛ دیـاری دانی قەدەم ▪ هُرم گرفتن هوا از شدت گرما

**کەلستن** / kel(i)stin/: ☜ **کولاندن**

**کەلسیوم** / kelsyum/: ناو. توخمی کیمیاوی کانزا،

بە ژمارەی ئەتومی ٢٠ و کێشی ئـەتومی ٤٠,٠٨، بـە ڕەنگـی سـپی نـەرم و تێکـەڵ لـە ئـاودا کـە خوێکانی لە سروشتدا زۆرە و مـاکی سـەرەکی و گرنگی ژیـانی گیانـەوەران، سـازێنەری ئێسـک، ددان، گەڵای داران و قاوغە ≡ کلسیم

**کەڵش / kelş/:** ☜ **قەڵش ـ١**

**کەڵشت / kel(i)şt/:** ☜ **قەڵش ـ١**

**کەڵشـتۆک / kelîştok/:** ئاوەڵـناو. ١. بـــە دارەوە قەڵشاو (میوە) ٢. نەکوڵاو (دانەوێڵـە) ≡ ١. شکافته بر درخت ٢. نیم‌پز

**کەڵشین / kelşîn/:** چاوگ. قەڵشـین؛ تلیشـیان ≡ شکافته شدن

**کەڵفس / kelfis/:** ☜ **کڵۆس**

**کەڵفیچ / kelfîç/:** ☜ **کڵۆس**

**کەڵک / kelk/:** ناو. ١. ☜ **کەڵك ـ١** ٢. نانی بەڕوو ≡ ١. ☜ **کەڵك ـ١** ٢. نان بلوط

**کەڵکـەڵ / kelkel/:** نـاو. ١. کوڵـــەکوڵ ٢. ☜ کەڵکەڵە ≡ ١. شدت گرما ٢. ☜ **کەڵکەڵە**

**کەڵکەڵە / kelkele/:** ☜ **کەڵکەڵە**

**کەڵگر / kelgir/:** ☜ **کەڵگیر**

**کـەڵگری / kelg(i)rî/:** نـاو. کـار و ڕەوتی بـە کـوڵ گریان ≡ شیون

**کەڵگە / kelge/:** ناو. شەلیە؛ شـێلەگەی جۆگـە ≡ بَرغ

**کەڵگیر / kelgîr/:** ئاوەڵـناو. کـەڵگر؛ یاریـدەدەر لـە وەخت و بێوەختدا ≡ دستگیر

**کەڵلا / kella/:** ناو. ١. کەلاجگ ٢. تیلە؛ مەڕمـەڕ؛ هەڵمات ≡ ١. قاپ درشت ٢. تیله

**کەڵلارە / kellare/:** ☜ **کەلارە**

**کـەڵلامێشـان / kellamêşan/:** نـاو. کـــەلایێن؛ کـەلایانێ؛ مێشـان؛ مێشـێن؛ پـلان؛ هەڵـماتین؛ ماتان؛ ماتێن؛ مەڕمەڕێن ≡ تیله‌بازی

**کەڵلک / kellik/:** ناو. کەلاوە؛ کاولە ≡ ویرانه

**کەڵلـە / kelle/:** نـاو. ١. کەلـە؛ کلـۆخ؛ کـەلێ؛ کەپوول؛ لە ئەستۆ بەرەو ژوور ‹هـا سـەف پێکـان پۆس کەڵلەی هامدەمان/ کەڵلەبڕ بەی پۆس کەڵلەمان تەمان «مەولەوی»› ٢. داری چەمێنراو بـۆ دەوری شـت ٣. دەورەی ئـارەخچن ٤. تـۆڵا؛ وردی بـە توندی پێکەوە نراو ٥. *[مەجاز]* ئاوەز؛ ئـەقڵ؛ مـژی ‹کابرایەکی بێ کەڵلەیە، لەم قسانە تێناگا› ٦. *[مەجاز]* دۆخی سەلامەتی دەروون؛ ڕەوان ‹کەڵلـەی پێـوە نییە، زوو هەڵـئەچێ› ≡ ١. کلّـەی سـر ٢. چنبـرەی چوبین ٣. قسمت جانبی عـرقچین ۴. اجـزاء بـە هـم چسبیدەی کلوخ شدە ۵. عقل ۶. اعصاب

▣ **کەڵلە گەرم بوون:** ١. تـووڕە بـوون ٢. مەسـت بوون ‹کەڵلەی گەرم بووە ئەم قسانە دەکا، بێتـەوە سەر خۆی لێ پەشیمان دەبێتەوە!› ≡ ١. عصبانی بودن ٢. مست بودن

**کەڵلەئاهەک / kelle'ahek/:** ناو. قسلی یەکگرتووی بە کلۆ ≡ آهک کلوخ شده

**کەڵلـــەبا / kelleba/:** ئاوەڵـــناو. *[مـــەجاز]* ١. سەرسەخت؛ سەرڕەق ٢. بـەفیز؛ لووتبـەرز ≡ ١. لجوج ٢. افاده‌ای

**کەڵلەبۆش / kelleboş/:** ئاوەڵناو. *[مەجاز]* بـێ‌ئـاوەز؛ نەفام ≡ تُهی‌مغز

**کەڵلەبێژنگ / kellebêjing/:** ناو. کەلەبێژنگ؛ داری دەوری بێژنگ ≡ چنبرەی غربال

**کەڵلە پا[1] / kellepa/:** نـاو. *[مـەجاز]* شـەکەتی لــە تاقەت کەوتوو ≡ خستەی از کارافتاده

**کەڵلە پا[2]:** ئاوەڵـناو. *[مەجاز]* ١. ژێـروڕوو؛ ژێروبـان؛ سەرنخوون ٢. لەت‌وکوت؛ لەت‌وپەت؛ شـڕووڕ ≡ ١. کلّەپا ٢. لت‌وپار

**کەڵلە پاچە / kellepaçe/:** ☜ **کەلەپاچە[1]**

**کەڵلە پڕی / kellepřî/:** نـاو. *[مـەجاز]* خۆپەسـندی؛ خۆپەرسـتی؛ دۆخـی خۆبـەزل زانـین ‹هـەر لـەو دەمانەی لە تەرەغـە دەژیـاین، بـە هـەوای لاوەتی و

کەللەپـڕی بـێعەقڵانـە، جـارێکی تـریش ... شـەڕ هەڵگیرسا «هـەژار، چێشـتی مجێـور». هـەروەها:

**کەللەپڕ** 🇮🇷 غرور

**کەللەتـەزێن / kelletezên/**: ئاوەڵـناو.[کینایـە] زۆر سارد (بۆ تراو) 🇮🇷 بسیار سرد

**کەللەچاخ / kelleçax/**: ئاوەڵناو.[پلار] سـەرزل 🇮🇷 کلەگُندە

**کەللەڕەق / kelleřeq/**: ☜ **کەللەشەق**

**کەللەزاوڕ / kellezawir/**: ئاوەڵناو.[پلار] کەللـەزراو؛ کەلەزات؛ ترسەنۆک 🇮🇷 بُزدل

**کەللەزراو / kellez(i)raw/**: ☜ **کەللەزاوڕ**

**کەللەشـەق / kelleşeq/**: ئاوەڵـناو.[پـلار] لاســار؛ سەرڕەق؛ کەللەڕەق ‹دەیانگوت: [هـەژار] پیـاوێکی کەللەشەقە، پووڵی دەدەینێ نایەوێ! «هەژار، چێشتی مجێور»› 🇮🇷 لجباز

**کەللەشەکر / kelleşekr/**: ☜ **کەللەقەند**

**کەللەقەند / kelleqend/**: ناو. کەلەقەند؛ کەلەقەن؛ کەللەشـەکر؛ کەلەشـەکر؛ شـیلە شـەکری دە قاڵـب کـراوی وشـکەوەبوو ‹ڕۆژی دوایـی کەللەقەندێکیان بۆ هێناین، هەمووی بـە دڵـۆپە زەرد ببـوو؛ یـان دەبـێ بڵـێم ڕەش هەڵـگەڕابوو! «هـەژار، چێشتی مجێور»› 🇮🇷 کلّەقند

**کـەللـەقـەنـدی / kelleqendî/**: نـاو. قوویچـک؛ کەللەقەندی 🇮🇷 مخروطی

**کەللەکۆن / kellekon/**: ئاوەڵناو.[کینایە] کۆنەپەرست 🇮🇷 مُرتجع

**کەللەگـەرم / kellegerm/**: ئاوەڵـناو.[کینایـە] کەلەگەرم: ١. تووڕە و تۆسن ٢. مـەس؛ مەسـت 🇮🇷 ١. عصبانی ٢. مست

**کەللەیی[1] / Kelleyî/**: ناو. کەلەگی؛ ئۆدەی ڕوو بـە بەربێلایی 🇮🇷 اتاق رو به تراس

**کەللەیی[2]**: ئاوەڵـناو. ١. کەمهۆش و گوێنـەدەر بـە هیچ ٢. شرۆشێت؛ شێتووێت ٣. زۆر تیژ و بڵـند 🇮🇷 ١. خُل‌وضع ٢. نامُتعادل ٣. بلند و رسا

**کەلم / kelm/**: نـاو. ١. کـەلپ؛ ددانی پێشـەوەی دڕندە ٢. کرم؛ کرمی؛ کـورم 🇮🇷 ١. دنـدان پیشـین درنده ٢. کِرم

**کەلما / kelma/**: ناو. کونی ورچ و پڵـنگ 🇮🇷 کُنـام خرس و پلنگ

**کەلمتـە / kelm(i)te/**: نـاو. گڵـمەت؛ کەسـتک؛ سندەگڵ 🇮🇷 کلوخ

**کەلمە / kelme/**: ☜ **کەڵەوە**

**کەلمەڵ / kelmel/**: ☜ **کەڵوپەڵ**

**کـەلمیز / kelmîz/**: ئاوەڵـناو.[پـلار] دەڵـەمیز؛ دەڵەمیز؛ میزەک؛ گمێزن؛ مێزن؛ بە کـردەوە یـا خووی میز بە خۆدا کردن 🇮🇷 شاشو

**کەلمێش / kelmêş/**: ☜ **کەڵەمێش**

**کەلناس / kelnas/**: ناو. ١. قەڵایی؛ کـانزای سـپی کردنەوەی پاقر ٢. سیق؛ جیقڵـدان؛ جیقنەمـەڵ 🇮🇷 ١. قلع ٢. چینەدان

**کەلنایا[1] / kelnaya/**: نـاو. کوڵـەکوڵ؛ جەنگـە 🇮🇷 عنفوان

**کەلنایا[2]**: ئاوەڵناو. لە گـەرمان سـوور هەڵـگەڕاو 🇮🇷 سُرخ‌شده از گرما

**کەلواز / kelwaz/**: نـاو. سەرماوسۆڵـە؛ سـەرمای سەخت 🇮🇷 سرمای شدید

**کەلواڵک / kelwałik/**: ☜ **کەڵواڵ**

**کەلوپا / kel û pa/**: ☜ **کەلەپاچە[1]**

**کەلوپاچکە / kel û paçke/**: ☜ **کەلەپاچە[1]**

**کەلوپـوڕ / kel û pûř/**: نـاو. ١. شـڕوبڕە؛ خڕکەوپڕکە ٢. کەلەپوور؛ جێماو لە مـردوو 🇮🇷 ١. خرت‌وپرت ٢. میراث

**کەلوپەل / kel û pel/**: ناو. کرت ـ مرت؛ کولمول؛ کول‌ومول؛ کەلپـەل؛ کەلمـەل؛ کـەل‌ومـەل: ١. شـت‌ومـەک؛ شمـەک؛ ئەسـپابات ٢. جلـک؛ جل‌وبەرگ ٣. شڕوبڕە؛ وردەوپـردە؛ شڕوشـاتاڵ؛

خڕکەوپڕکە ٤. ئـامراز؛ کەرەسـە؛ ئەسـپاب ⯀ ١. اسباب و اثاثیە ٢. لباس ٣. خرت‌وپرت ۴. ابزار

**کەلوچا / keluça/**: ناو. جۆرێ ماسی ڕەنگاوڕەنـگ ⯀ نوعی ماهی رنگارنگ

**کەلوز / keluz/**: ناو. ١. فنق؛ بـەری داری کـەلووز کە خڕ و گچکەیـە و توێکڵـی قـاوەیی و ڕەقـە و کاکڵـەکەی تـەژی لـە ڕۆنـە و وەکـوو چـەرەز دەخورێ ٢. بەری داری سنەوبەر ⯀ ١. فندُق ٢. میوەی درخت صنوبر

**کەڵوکۆم / kel û kom/**: ئاوەڵـناو. خـێچ وخـوار؛ چەفت‌وچەوێڵ ⯀ کج‌وکوله

**کەڵومەڵ / kel û mel/**: ☜ **کەڵوپەڵ**

**کەلوەپەمۆ / kelwepemo/**: نـاو. شـرش؛ پـەمۆی پێچراوی گلۆڵەکراو ⯀ غُنده؛ غوزەی پنبە

**کەلوەڕێژ / kelweřêj/**: ئاوەڵـناو. تایبەتمەندی نۆک و نیسکێ کە پەڕیبێ ⯀ ویژگی نخود یا عدسی کـە بیش از حد رسیده و خشک شده باشد

**کەلوەسمە / kelwesme/**: ☜ **کەلۆسمە**

**کەلۆت / kelot/**: ناو. کرۆژ ⯀ کلوچ

**کەلۆتن / kelotin/**: ☜ **کورۆژتن**

**کەلۆتە / kelote/**: ناو. کەڵپک: ١. تێکوڵی دەنکی کڕەکراو ٢. کرپک؛ کەپەک ٣. قرتماخەی بـرین ⯀ ١. پوست دانه‌های آشی ٢. نُخاله ٣. خشک‌ریشه

**کەلۆتیان / kelot(i)yan/**: ☜ **کورۆژیان**

**کەلۆژتن / kelojtin/**: ☜ **کورۆژتن**

**کەلۆژتیان / kelojt(i)yan/**: ☜ **کورۆژیان**

**کەلۆس / kelos/**: ☜ **کلۆس**

**کەلۆسمە / kelosme/**: ناو. کەلوەسمە؛ کەلەسمـە؛ کەلیسمە؛ کرمی نۆکی سەوز ⯀ کرم نخود

**کەلۆک / kelok/**: نـاو. ١. ☜ **کلـۆت** ٢. نێرییـە کێوی دوو ساڵە ⯀ ١. ☜ **کلۆت** ٢. شاک وحشـی دوساله

**کەلو / kelû/**: نـاو. ١. کلـووی کولـکە و پـەمۆ ٢. بەری گیا کە چەند دەنکی بەڕیز تێدایە ‹کـەلووی مـاش؛ کـەلووی نـۆک› ٣. پۆلـکە؛ پاقلـەکێوی ٤. برجی ئاسمان ٥. ئاڵقەی چنینی لە بەن ٦. بڕوار؛ قەدی چیا ٧. ڕیش سپی و بەڕێز لـە ئاواییـدا ٨. تەتڵەمیوە؛ قۆزاخەی کرمی هەورێشم ⯀ ١. آغُنده ٢. نیامک گیاه ٣. باقلای کـوهی ۴. بُـرج آسـمان ۵. حلقەی بافتنی نخی ۶. کمر کوه ٧. ریش سفید آبادی ٨. پیلەی کرم ابریشم

**کەلوچن / kelûçin/**: ئاوەڵناو. بە ئاڵقەی بەن چنراو ‹گۆرەوێ کەلووچن› ⯀ بافتەی حلقەای

**کەلوز / kelûz/**: ناو. فندق؛ فنق ⯀ فندُق

**کەلوک / kelûk/**: ناو. ١. نیـو چارەگـە خشـت ٢. جۆرێ ماسی ⯀ ١. یک‌هشتم آجر ٢. ماهی سلمون

**کەلوکە / kelûke/**: ناو. پارچە خشت یـا ئـاجۆری چکۆڵە بۆ ناوئاخن ⯀ قطعەی کوچک خشت یا آجر در کار بنایی

**کەلـول / kelûl/**: ئاوەڵـناو. قـەش؛ قەشـان؛ تـوێڵ سپی (ئاژەڵ) ⯀ پیشانی سفید (دام)

**کەلوم / kelûm/**: ناو. پەیف؛ قسە؛ کەلام ⯀ کلام

▣ **کەلوم هۆمای**: ☜ **کەلامێ هۆمای**

**کەلوم هومای**: ☜ **کەلامێ هۆمای**

**کەلون / kelûn/**: ناو. بژەن؛ کلۆم؛ کێلوون؛ کلیل و گۆڵە ⯀ قفل و کلید چوبی

**کەلـویش / kelûyş/**: نـاو. کـەلیش: ١. **گۆشـتی** چەقاڵتە ٢. گۆشتی لـەڕی خـراپ ⯀ ١. **گوشـت** رگ‌آلود ٢. گوشت حیوان لاغر

**کەڵه / kelh/**: ئاوەڵناو. ١. بێ‌هاوتا؛ بێ‌وێنـە؛ نایـاب ٢. دەلال؛ جوان ٣. باش؛ خاس ⯀ ١. بی‌نظیـر ٢. زیبا ٣. خوب

**کەلە[1] / kele/**: نـاو. ١. کـەللە؛ داری داهێنـراو بـۆ دەوری بێژنگ و... ٢. فرۆی ناو قامیش ٣. داری دەوری پەڕی خـەڕەک ٤. قـەڵا؛ کـەلات؛ دژ ٥. کەللە؛ سەر ⯀ ١. چنبرەی چوبین ٢. آغوزی کـە در

کاوک نی بە عمل آید ۳. حلقەی چرخ دوک ریسی ۴. قلعه ۵. کله؛ سر

**کەلەـ**[2]: پێشوشە. ۱. کەم؛ هەندێک ‹کەلەزات› ۲. شکاو؛ شکیاگ ‹کەلەدیزە› ☰ ۱. کم ۲. شکسته

**.کەلە**[3]: ☜ ـ **کەڵە**°

**کەلەبا / keleba/**: ناوەڵناو. *[کینایە]* خۆبەزل‌زان؛ خۆبایی ☰ مُتکبر

**کەلەباب / kelebab/**: ☜ **کەڵەشێر**

**کەلەباد / kelebad/**: ناو. بای وادە؛ شەماڵی سەرەبەهار کە بەفر دەتوێنێتەوە ☰ باد بهاری

**کەلەبچە / kelebçe/**: ☜ **کەلەپچە**

**کەلەبدون / kelebdun/**: ناو. نەقش لە دیوار و چوارچێوە بۆ جوانی ☰ دکور

**کەلەبڕ / kelebiř/**: ناو. پارچە زەوی کە تایبەتی بە کەسێ بەخشرابێ ☰ قطعه‌زمین تیول

**کەلەبەر / keleber/**: ناو. کەلەوەر: ۱. قەڵش لە دیوار یا لە شاخی بەردیندا ۲. *[کینایە]* دەرەتانی تەنگ و دژوار ۳. برگەی دادڕاو لە جۆگە و مەشتە بۆ ئاویاری ٤. *[مەجاز]* ماڵ؛ خانوو ☰ ۱. شکاف در دیوار یا کوه سنگی ۲. گذرگاه تنگ و دشوار ۳. خط جوب ۴. خانه

**کەلەبێژنگ / kelebêjing/**: ☜ **کەللەبێژنگ**

**کەلەپاچە**[1] **/ kelepaçe/**: ناو. کەلپاچە؛ کەللەپاچە؛ کەل‌وپا؛ کەل‌وپاچکە؛ سەروپا؛ سەروپێ ☰ کله‌پاچه

**کەلەپاچە**[2]: ناوەڵناو. *[مەجاز]* لەت‌وکوت؛ کوت‌ولەت ☰ لت‌وپار

⊡ **کەلەپاچە کردن**: لەت‌وکوت کردن ☰ لت‌وپار کردن

**کەلەپچە / kelepçe/**: ناو. کەلەبچە؛ کەلەمچە؛ کەڵەبچە؛ بەلەچەک؛ بەلەچە؛ ئامرازێک بە دوو ئاڵقەی ئاسنینەوە، دەستی بەندکراوی پێ دەبەستن دەرنەچێت ‹ئاخرین ماڵی ژیانم کونجی بەندیخانەیە/ ئەم کەلەپچە مەرهەمی زامی دڵی دێوانەیە «قانع»› ☰ دستبند زندانی

⊡ **کەلەپچە کردن**: دەست بە دەستبەندەوە کردن ☰ دستبند کردن

**کەلەپۆ / kelepo/**: ناو. ۱. ئاسۆ؛ ئاسۆگ؛ زێواری ئاسمان ۲. بەلال؛ گەنمەشامی برژاو ☰ ۱. افق ۲. بلال

**کەلەپور / kelepûr/**: ☜ **کەلەپووڕ**

**کەلەپوورگر / kelepûrgir/**: ناو. کەلەپووڕگر؛ بەشبەر؛ میراتگر ☰ وارث

**کەلەپووڕ / kelepûř/**: ناو. کەلەپوور: ۱. هەر شتێکی جێماو لە مردوو ۲. کەل‌وپەلی ناو ماڵ ۳. پیتاک؛ باج ٤. شاواز؛ شاواش؛ شاباش؛ پارەی خەلاتی لۆتی لە زەماوەند ☰ ۱. میراث ۲. خرت‌وپرت و اثاثیه ۳. باج ۴. شاباش

**کەلەپووڕگر / kelepûřgir/**: ☜ **کەلەپوورگر**

**کەلەتۆر / keletor/**: ناو. کەلەی؛ کرێش؛ کرێژی سەر ☰ شوره‌ی سر

**کەلەخ / kelex/**: ناو. کەلەش: ۱. لەشی بنیادەم ۲. کەلاک؛ لاش ☰ ۱. کالبد انسان ۲. لاشه‌ی مُردار

**کەلەرم / keler(i)m/**: ناو. کەلەم؛ لەهانە؛ لەهەن؛ لانە؛ گیای یەک یان دوو ساڵان، بە گەڵای پانی سپی، سەوز یان بنەوشەوە ☰ کلم

**کەلەڕەش / keleřeş/**: ناو. قەل؛ قالاو ☰ کلاغ

**کەلەزات / kelezat/**: ناوەڵناو. *[پەلار]* کەلەزراو؛ ترسەنۆک ☰ ترسو

**کەلەزراو / kelez(i)raw/**: ☜ **کەلەزات**

**کەلەزرک / kelezirk/**: ناو. جیقڵدان؛ چینەدانی مەل ☰ چینه‌دان

**کەلەزل / kelezil/**: ناوەڵناو. سەرزل؛ سەرقەوی ☰ کله‌گُنده

**کەلەزە / keleze/**: ناو. کەلژە؛ کەلیجە؛ کەلیژە؛ سابرێن؛ تەگە؛ نێری ☰ قوچ

**کەلەس / keles/:** ☜ **کەڵەس ـ٢**

**کەلەستون / kelestûn/:** ☜ **کۆلکەزێرینە**

**کەلەستە / keleste/:** ناو. ١. ☜ **کەرستە** ٢. کەلەخ؛ قەوارەی لەشی مرۆ ⇐ ١. ☜ **کەرستە** ٢. کالبد آدمی

**کەلەسمە / keles(i)me/:** ☜ **کەلۆسمە**

**کەلەسونگ / kelesung/:** ☜ **کەلاسونگ**

**کەلەش[١] / keleş/:** ☜ **کەلەخ**

**کەلەش[٢]:** ئاوەڵناو. ١. جوان و نازدار ٢. کەچەڵ؛ کەچەڵ ٣. شەلاتی؛ قەلاش ٤. چابک؛ مەزبووت ⇐ ١. زیبا و دلربا ٢. کچل ٣. شارلاتان ۴. چالاک

**کەلەشە / keleşe/:** ناو. کەلیشە؛ کەلیشۆ؛ کەلەشەی؛ ڕێگر؛ چەتەی تالانکەر ⇐ راهزن

**کەلەشەکر / keleşekr/:** ☜ **کەللەقەند**

**کەلەشەی / keleşey/:** ☜ **کەلەشە**

**کەلەشەیی / keleşeyî/:** ناو. چەتەگەری؛ چەتەیی؛ جەردەیی؛ کاری چەتە ⇐ راهزنی

**کەلەف / kelef/:** ☜ **کلاف**

**کەلەفیچ / kelefîç/:** ئاوەڵناو. [پەلار] ددانکەل ⇐ دندان‌شکسته

**کەلەقەن / keleqen/:** ☜ **کەللەقەند**

**کەلەقەند / keleqend/:** ☜ **کەللەقەند**

**کەلەک[١] / kelek/:** ناو. ١. قولاخە؛ پینەی لێواری کەوش ٢. کوناوەجە؛ بانجە؛ ڕۆچنە ⇐ ١. پینه بر حاشیه‌ی کفش ٢. روزنه

**کەلەک[٢]:** ئاوەڵناو. کولەک؛ کلۆک؛ زووکوڵ (دانەوێڵە) ⇐ زودپز (دانه)

**کەلەکوتک / kelekutk/:** ناو. کاسەی دارینی کەڵبوو؛ سوێنەی دارینی کەچوکرووچ ⇐ کاسه‌ی چوبین لبه شکسته

**کەلەکوچ / kelekuç/:** ناو. شەپیلک؛ سەرپیل؛ ئێسکی گەورە و پانی شان ⇐ استخوان کتف

**کەلەکە / keleke/:** ناو. ١. ☜ **کێلەکە** ٢. کاسەی کەل؛ کاسەی دارینی لێوخوراو ٣. دەفری سوالەتی گوڵ و ڕێحان تێدا چاندن ⇐ ١. ☜ **کێلەکە** ٢. کاسه‌ی چوبین وارفته ٣. گُلدان سفالی

**کەلەکەقوپاو / kelekequpaw/:** ئاوەڵناو. زکقوپاو؛ لەڕ و لاواز ⇐ لاغر

**کەلەکەل / kelekel/:** دەنگەناو. دەنگی کولدانی ئاوی سەر ئاگر ⇐ قُل ـ قُل

**کەلەکەمتار / kelekemtar/:** ☜ **کەمتار**

**کەلەگەرم[١] / kelegerm/:** ناو. ١. جەنگەی گەرمای ڕۆژ ٢. [کینایە] چلەی هاوین ⇐ ١. اوج گرمای روز ٢. چلّه‌ی تابستان

**کەلەگەرم[٢]:** ☜ **کەللەگەرم**

**کەلەگەور / kelegewr/:** ناو. کۆللارە؛ باڵدارێکی ڕاوکەرە ⇐ از پرندگان شکارچی

**کەلەگی / kelegî/:** ☜ **کەللەیی[١]**

**کەلەلا / kelela/:** ئاوەڵناو. ١. شەکەت؛ ماندوو؛ مانگ ‹زۆرمان کار کرد، کەلەلا بووین› ٢. حاڵشڕ؛ نەخۆشی زۆر نەخۆش ‹بەو نەخۆشییە تەواو کەلەلا بووە› ٣. گێژ و وڕ؛ هاژ و کاژ ‹من هێندە دەخۆمەوە لە کلکەی شابان/ مەست و کەلەلا بۆی بکەوم تا جێژن «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ٤. برینداری خراپ ‹شەڕ زۆرێکی کەلەلا کرد› ٥. ڕەق و کز ‹پیر و کەنەفت و کەلەلا/ هەموو لەشم هەلاهەلا «هێمن»› ⇐ ١. خسته ٢. بیمار بدحال ٣. گیج و منگ ۴. زخمی جدی ۵. زرد و ضعیف

⊡ **کەلەلا کەوتن:** ١. لەبەر ماندوویی زۆر لە جووڵە کەوتن ٢. بە هۆی نەخۆشی، هێز و تین تێدا نەمان ⇐ ١. از خستگی نا نداشتن ٢. از بیماری بی‌حال بودن

**کەلەم / kelem/:** ناو. ١. ☜ **کەلەرم** ٢. دڕک؛ چقڵ ٣. داری نووکدادراو ٤. تیشەشاخی باریک ⇐ ١. ☜ **کەلەرم** ٢. خار ٣. چوب نُک تراشیده ۴.

کوە سنگی نوکتیز

**کەلەمان** / keleman/: ناو. قارەمان؛ پیاوی هەرە ئازا 🇮🇷 قهرمان

**کەلەمایش** / kelemayîş/: چاوگ. زوان کرانەوە بۆ قسە کردن 🇮🇷 زبان باز شدن به صحبت

**کەلەمپەر** / kelemper/: ناو. چێشتی کەنگری وشکەوەکراو 🇮🇷 آش کنگر خشک‌شده

**کەلەمچە** / kelemçe/: ☜ کەلەپچە

**کەلەمقاو** / kelem(i)qaw/: ناو. سینۆزیت؛ ئاییسان و هەو کردنی سینووس 🇮🇷 سینوزیت

**کەلەمکاشول** / kelemkaşûl/: ناو. گیایەکە لە کەرەوز دەچێ، بۆنخۆشە و گەڵاکەی دەخورێ، بەتایبەت لە ترشیاتی دەکەن 🇮🇷 گیاهی خوارکی

**کەلەموک** / kelemuk/: ناو. داش کەلەم؛ جۆرێ کەلەمی وەک توور 🇮🇷 کلم قُمری

**کەلەمەک** / kelemek/: ناو. ١. زۆر و زوڵم ٢. ☜ کەڵەوە 🇮🇷 ١. ظلم و زور ٢. ☜ کەڵەوە

**کەلەمی** / kelemî/: ناو. گیایەکە گەڵاکەی بە وشکی لە تووتن ئەکا 🇮🇷 گیاهی است

**کەلەن** / kelen/: ناو. ١. قەڵەن؛ شیربایی ٢. قەڵادەی ملی تاژی 🇮🇷 ١. شیربها ٢. قلادەی سگ شکاری

**کەلەندر** / kelendir/: ☜ کەرەنتو

**کەلەندی** / kelendî/: ☜ کەرەنتو

**کەلەندین** / kelendîn/: ناو. بەفری بە سەر یەکدا کەڵەکەبوو 🇮🇷 تودەی برف بر هم انباشته

**کەلەنگ** / keleng/: ☜ کەنگەر

**کەلەواژ** / kelewaj/: ناو. سەرەوخوار؛ وەرگەڕاو؛ هەڵگەڕاوە 🇮🇷 واژگون

⊡ **کەلەواژ بونەوە**: هەڵگەڕانەوە 🇮🇷 واژگون شدن

**کەلەواژی** / kelewajî/: ناو. قسەی بێشەرمانە 🇮🇷 سخن وقیح

**کەلەوەر** / kelewer/: ☜ کەلەبەر

**کەلەه** / keleh/: ناو. قەڵا؛ کەلە 🇮🇷 قلعه

**کەلەی** / keley/: ناو. کەلەتۆر؛ کرێش؛ کرێژی سەر 🇮🇷 شورەی سر

**کەلهان** / kelhan/: ☜ کوڵان

**کەلهاندن** / kelhandin/: چاوگ. کوڵاندن؛ کوڵانن 🇮🇷 جوشاندن

**کەلهۆشک** / kelhoş(i)k/: ناو. درۆشم؛ داغی نیشانە بە ماڵاتەوە 🇮🇷 داغ نشانەی دام

**کەلهۆک** / kelhok/: ناو. قەڵایچە؛ قەڵای پچووک 🇮🇷 قلعەی کوچک

**کەلهو** / kelhû/: ئاوەڵناو. دەبەنگ؛ کەمفام؛ گەلحۆ 🇮🇷 نفهم؛ احمق

**کەلهە** / kelhe/: ناو. قەڵا 🇮🇷 قلعه

**کەلهەیدان** / kelheydan/: ناو. جۆرێ شۆربا 🇮🇷 نوعی آش

**کەلهین** / kelhîn/: چاوگ. کوڵان؛ کوڵیان 🇮🇷 جوشیدن

**کەلی**[1] / kelî/: ناو. ١. نێوان‌تێکەوتوویی (دیوار و ددان و ...) ٢. کەلووی دەنکی گیا ٣. کونی شانەهەنگوێن 🇮🇷 ١. شکاف؛ فاصله (در دیوار، میان دندان‌ها و ...) ٢. نیامک دانەهای گیاه ٣. شبکەی موم

**کەلی**[2]: ئاوەڵناو. ١. بێخوێ ٢. کلکقوڵە ٣. گوێکورت ٤. کاڵ؛ نەگەیشتوو ٥. کاڵ؛ نەکوڵاو 🇮🇷 ١. بی‌نمک ٢. دُم‌کوتاه ٣. کوتاەگوش ۴. کال ۵. ناپُخته

**کەلیان** / kelyan/: چاوگ. کوڵیان؛ کوڵان 🇮🇷 جوشیدن

**کەلیجە** / kelîce/: ☜ کەلەزە

**کەلیژە** / kelîje/: ☜ کەلەزە

**کەلیسمە** / kelîsme/: ☜ کەلۆسمە

**کەلیش** / kelîş/: ☜ کەلویش

**کەلیشۆ** / kelîşo/: ☜ کەلەشە

**کەلیشە** / kelîşe/: ☜ کەلەشە

**کەلیک** / kelîk/: ئاوەڵکار. تاوێک؛ دەمێکی کەم 🇮🇷 زمانی اندک

**کەلیلان** / kelîlan/: ناو. ١. داخ و عەزرەت ٢. کولەکولی گەرمای هاوین 🇮🇷 ١. تأسف و حسرت ٢. شدت گرمای تابستان

**کەلیلک** / kelîlik/: ناو. کلیلی دارینی گۆڵە درگا 🇮🇷 کلید چوبین در

**کەلیمە** / kelîme/: ناو. وشە؛ واژە؛ بێژە ١. چکۆلەترین یەکەی وتار و نووسراوە کە بە تەنیایی واتایەک دەردەبڕێت ‹یەک کەلیمە قسەی نەکرد› ٢. هەریەکە لە بەشگەلی ڕستەیەک کە بە مەودا یان نیشانەی خاڵبەندی لێک جیا دەبنەوە ‹ئەم ڕستە شەش کەلیمەیە› 🇮🇷 ١و٢. کلمه

**کەلین** / kelîn/: ☜ **کولان**

**کەلێ** / kelê/: ئاوەڵناو. کەلی؛ بێ‌خوێ 🇮🇷 بی‌نمک

**کەلێژ** / kelêj/: ناو. ١. کلێنچکەی پەز؛ قیتکەی سەر دووگ ٢. *[کینایە]* دەسەلات و زۆرداری 🇮🇷 ١. دُنبالچەی گوسفند ٢. توانایی

**کەلێن** / kelên/: ناو. ١. قەڵشت؛ تلیش ٢. *[مەجاز]* پەسیو؛ ئەنوا؛ پەناگا ٣. *[مەجاز]* بۆسە؛ چەپەر؛ خەڵ؛ سپێر ٤. *[مەجاز]* هەل؛ کێس؛ دەرفەت 🇮🇷 ١. شکاف ٢. پناهگاه ٣. کمین ۴. فُرصت

▣ **کەلێن تێکەوتن:** *[کینایە]* دووبەرەکی کەوتنە نێوان 🇮🇷 شکاف و اختلاف افتادن

**کەلێنەشاخ** / kelêneşax/: ناو. گەوەڕ؛ شکێر 🇮🇷 شکاف کوه

**کەڵ**[1] / keł/: ناو. ١. زەنگەتلیش؛ ئاگردوو؛ بڕەدار ٢. نێری گامێش؛ گای فەحل ٣. کەڵ؛ حەیوانێکی کێوییە ٤. کوڵ؛ جۆشی ئاو ٥. کەڵک؛ فایدە؛ بەهرە 🇮🇷 ١. قطعەی هیزم ٢. گاو گُشن ٣. کل کوهی ۴. جوش آب ۵. بهره

▣ **کەڵ گامێش:** نێرەی گامێش 🇮🇷 گاومیش نر

▣ **کەڵ بە مو بەند بون:** *[کینایە]* هەموو شتێک لە ژێر فەرمانی دەسەڵاتدا بوون و کەس بە هیچ نەوێران ‹منی زنجیرپسێن لێرە ئەسیری بسکی جوانێکم/ زەمانە گەرچی ئاڵۆز و پەشێوە کەڵ بە موو بەندە «هێمن»› 🇮🇷 دیکتاتوری کامل حاکم بودن

**کەڵ دان:** چێڵ لە کەڵ کێشان 🇮🇷 گُشن دادن گاو

**کەڵ گرتن:** ئاوس بوونی چێڵ لە کەڵەگا 🇮🇷 آبستن شدن گاو از گُشن

**کەڵ هاتن:** هاتنە کەڵ؛ نێر خواستنی چێڵ 🇮🇷 گُشن خواستن گاو ماده

**قنگی کەسێ وە کەڵ بون:** *[ئاشیرین؛ پەلار]* لە دەردیسەر گەڕان 🇮🇷 سر کسی بوی قُرمەسبزی دادن

**هاتنە کەڵ:** ☜ **کەڵ هاتن**

**کەڵ**[2]: ئاوەڵناو. ١. درشت؛ گەورە ٢. زل و زەلام ٣. *[کینایە]* ئازا و بەکار 🇮🇷 ١. بُزرگ ٢. گُندە ٣. شجاع و کارا

**کەڵ**[3]: ☜ **کەڵە ـ**

**کەڵاش** / kełaş/: ناو. ١. ☜ **کەلاش** ٢. ☜ **کڵاش-٢**

**کەڵاشتن** / kełaştin/: ☜ **کەلاشتن**

**کەڵاشتی** / kełaştî/: ☜ **کەلاشتی**

**کەڵاشچن** / kełaşçin/: ☜ **کڵاشچن**

**کەڵاشە** / kełaşe/: ☜ **کڵاش-٢**

▣ **کەڵاشە کردن:** ☜ **کڵاشە کردن**

**کەڵاف** / kełaf/: ☜ **کڵاف**

**کەڵافە** / kełafe/: ☜ **کڵاف**

**کەڵافەت** / kełafet/: ☜ **قەڵافەت**

**کەڵان**[1] / kełan/: ☜ **کوڵان**

**کەڵان**[2]: ئاوەڵناو. زل؛ زەبەلاح 🇮🇷 لندهور

**کەڵانتەر** / kełanter/: ناو. ١. سەرۆکی کەڵانتەری ٢. بەرپرسی بەڕێوەبەری قانوون لە شار یان

پارێزگایەکدا (لە ئەمریکا) ٣. [کۆن] کوێخا؛ قێخا؛ کەیخودای گەڕەک ٤. سەرۆکهۆز؛ سەرەکهۆز؛ گەورەی هۆزێ کە لە بناری کێو و چیادا دەژین ▤ ١تا٣. کلانتر ۴. رئیس ایل

**کەلانتەری** / kełanterî/: ناو. ١. مەزرینگەیەک کە بەرپرسی بەڕێوەبردنی قانوون لە شار یان بەشێک لە شارە ٢. بینای ئەو مەزرینگەیە ٣. پیشەی کەلانتەر ▤ ١تا٣. کلانتری

**کەلاندن** / kełandin/: ☜ **کولاندن**

**کەلانە**[1] / kełane/: ناو. قوبە؛ دوگمەی زل؛ قۆپچەی درشت ▤ دُکمەی درشت

**کەلانە**[2]: ئاوەڵناو/ئاوەڵکار. ئازایانە ▤ شُجاعانه

• **کەلانە**[3]: پاشگر. ـکەلە؛ ـکەلە؛ نیشانەی چکۆلەی خۆشەویست ‹خڕکەلانە› ▤ پسوند تصغیر و تحبیب

**کەڵب** / kełb/: ناو. ١. ☜ **کلب ـ١** ٢. کلۆی زۆر پچووک ▤ ١. ☜ **کلب‌ـ١** ٢. کلوخک

**کەڵبە** / kełbe/: ناو. ١. ☜ **کلب ـ١** ٢. کەڵپەبەرد؛ بەردی زۆپ ٣. هەنجیری کاڵ ▤ ١. ☜ **کلب‌ـ١** ٢. سنگ برجسته ٣. انجیر نارس

**کەڵبەزین** / kełbezîn/: ناو. بەرزین؛ زینکۆ ▤ قاچ زین

**کەڵپ** / kełp/: ناو. ١. کەڵبە؛ کلۆی پچووک ٢. سەگ؛ کسۆک ٣. ☜ **کلب‌ـ١** ▤ ١. کلوخک ٢. سگ ٣. ☜ **کلب‌ـ١**

**کەڵپانێر** / kełpanêr/: ناو. ١. گامێشی دووساڵە ٢. [پلار] لاوی قەڵەو و زەبەلاح ▤ ١. گاومیش دوساله ٢. جوان چاق و گُنده

**کەڵپدرێژ** / kełpd(i)rêj/: ئاوەڵناو. کێلبەڵۆ ▤ دندان‌دراز

**کەڵپیک** / kełpik/: ☜ **کەڵۆتە**

**کەڵپۆس** / kełpos/: ناو. کەڵپۆست: ١. پێستەی بە تیسکەوە کە لە سەری دادەنیشن ٢. عەبای تیسکن لە پێستەپەز ‹پەروانە جە پەی هەوای دۆسەوە/ پەی دۆس مەگێلۆ وە کەڵپۆسەوە «بێسارانی»› ▤ ١. پوستین زیرانداز ٢. پوستین پوشیدنی

**کەڵپۆست** / kełpost/: ☜ **کەڵپۆس**

**کەڵپە** / kełpe/: ناو. ١. ☜ **کلب ـ١** ٢. دەماغە؛ بلندایی بەردین لە کێودا ▤ ١. ☜ **کلب ـ١** ٢. دماغه

**کەڵپەبەرد** / kełpeberd/: ناو. کەڵبە؛ بەردی زۆپ ▤ سنگ برجسته

**کەڵپەترە** / kełpet(i)ře/: ناو. [پلار] قسەی هیچ و پووچ ▤ یاوه

**کەڵپەک** / kełpek/: ناو. سۆس؛ سۆست ▤ سبوس

**کەڵپینجە** / kełpînce/: ناو. مشتەکۆڵە؛ سوخورمە؛ گومرچە ▤ سُقُلمه

**کەڵپێ** / kełpê/: ئاوەڵناو. تەمەڵ؛ تەمبەڵ؛ کەهاڵ ▤ تنبل

**کەڵتە** / kełte/: ئاوەڵناو. ١. نۆژەن؛ نفت‌ونۆڵ ‹خۆم کەڵتە کردەوە› ٢. دەمەزەرد؛ دەمەزەن؛ سەرنیا؛ تێژکراو ٣. سەڵیتە و زمان‌درێژ ▤ ١. نونوار ٢. تیزشده ٣. سلیطه

**کەڵتەوەن** / kełtewen/: ئاوەڵناو. نامۆ؛ نەناسراو ▤ ناشناس

**کەڵخە** / kełxe/: ☜ **کەوچێز**

**کەڵدڕ** / kełdiř/: ناو. ئالفێکە ▤ علفی است

**کەڵک** / kełk/: ناو. ١. کەڵک؛ بارە؛ زەرۆڵە؛ فایدە ‹مەڵێن کەڵکی نەبوو، ڕۆیی، جەهەننەم/ سەرم قەڵغانە بۆ تیری قەزاتان «نالی»› ٢. سوانە؛ پاسارە ٣. چەڵک؛ سەقا؛ سەقاوش؛ سەقاو؛ قوتان؛ کەراقی؛ کەراوی؛ باڵدارێکی زەلامی ماسی‌خۆرە، قورتمێکی لە خوار دندووکی هەیە ماسی و ئاوی تێدا عەنبار دەکا ٤. بان؛ سەربان ٥. باڵدارێکی سپییە بە قەد کۆترێک ٦. پێداویستی؛ ئاتاجی ٧. گرد؛ تەپە ▤ ١. بهره ٢. برآمدگی لب بام ٣. مُرغ

سقا؛ پلیکان ۴. پشت‌بام ۵. پرندەای سفید رنگ در اندازەی کبوتر ۶. احتیاج ۷. تپە

⊡ **کەڵک تێکەوتن:** ئاتاج بە کەسێ بوون ☰ مُحتاج بە کسی شدن

**کەڵک دان:** بەهرە دان ☰ بهرە دادن

**کەڵک دانەوە:** بەهرە گەیاندنی کڕدراو ☰ سود رساندن مال خریداری شدە

**کەڵک نەمان:** خێر پێ نەمان ‹بە داخەوە هونەر کەڵکی نەماوە› ☰ سود نداشتن

**کەڵکی کەسێک گرتن:** *[کینایە]* بە کاری کەسێک هاتن؛ بە دەرد کەسێ خواردن ‹دیارم دەیری عیشقە، جێ بە سووتن بێ لەوێ دەگرم/ کە من مشتێ چڵوچێو بم بە چی بم؟ کەڵکی کێ دەگرم؟ «مەحوی»› ☰ بە کسی بهرە رساندن

**بە کەڵک بوون:** بەکەڵکەوە بوون؛ دەرد خواردن ☰ بە درد خوردن

**بە کەڵک هاتن:** بە کار هاتن؛ دەرد خواردن ☰ فایدە داشتن؛ بە درد خوردن

**بە کەڵکەوە بوون:** ١. بەکەڵک بوون؛ دەرد خواردن ٢. کار کردن ☰ ١. بە درد خوردن ٢. کار کردن

**بە کەڵکەوە نەهێشتن:** لە کەڵک خستن؛ تەواو بێ‌کەڵک کردن ☰ از حیّز انتفاع انداختن

**کەڵکاوەژۆ / kełkawejo/:** ناو. کاری بە پێچەوانە کەڵک وەرگرتن ☰ سوءاستفادە

**کەڵکبڕاو / kełkb(i)řaw/:** ئاوەڵناو. ئاڕفتە؛ پەک‌کەوتە ☰ ازکارافتادە

**کەڵکگر / kełkgir/:** ئاوەڵناو. بەکار؛ پڕفایدە ‹ئەی دوکتۆر فوئاد ئەی شێری نەمر/ هەتا قیامەت بۆ کورد کەڵک‌گر «قانع»› ☰ بهرەرسان

**کەڵکەڵە / kełkełe/:** ناو. کەڵکەڵ؛ کەڵکەلە؛ خولیا ☰ هوا و هوس

**کەڵکەڵەمێشە / kełkełemêşe/:** ☜ **کاکڵەموشان**

**کەڵکەڵەوانی / kełkełewanî/:** ناو. کوند؛ بایەقوش؛ بوو ☰ جُغد

**کەڵکیت / kełkît/:** ☜ **کەرکیت**

**کەڵگەخەراوە / kełgexerawe/:** ناو. کەلاوە ☰ ویرانە

**کەڵمێش / kełmêş/:** ناو. مەلشە؛ کەڵەمێش؛ مێشی درشت ☰ مگس درشت

**کەڵواڵ / kełwał/:** ناو. کەلوالک؛ گیایەکە بنەکەی دەخورێ ☰ گیاهی با پیاز خوراکی

**کەڵوان / kełwan/:** ناو. بەرێکی دارمازوو، بۆ دەباغی دەبێ ☰ ثمری از درخت مازوج

**کەڵوە / kełwe/:** ناو. ١. ☜ **کلب‌ـ١** ٢. قەڵپووزی زین ٣. کڵۆی چکۆلە ☰ ١. ☜ **کلب ـ١** ٢. قاچ زین ٣. کلوخک

**کەڵوەز / kełwez/:** ناو. ئەشکەوت؛ شکەفت ☰ غار

**کەڵوەلا / kełwela/:** ئاوەڵناو. کەلوەلا؛ کەلەلا؛ زۆر بریندار ‹بە چەقۆ دەس خوەم کەلوەلا کرد› ☰ زخمی حاد

**کەڵوەڵا / kełweła/:** ☜ **کەڵوەلا**

**کەڵۆت / kełot/:** ☜ **کلۆت**

**کەڵۆخە / kełoxe/:** ☜ **کەوچێز**

**کەڵۆس / kełos/:** ☜ **کلۆس**

**کەڵە[1] / kełe/:** ناو. ١. جۆرێ برنج ٢. بەڵایەکە لە ڕەگی تووتن و بێستان دێتە دەر و وشکی دەکات ٣. کولە؛ کاری خۆ گرتن لە قسەی خەڵک ☰ ١. نوعی برنج ٢. انگل گیاە توتون و پالیز ٣. فالگوش

⊡ **کەڵە کردن:** خۆ داگرتن بۆ قسەی خەڵک ☰ فالگوش ایستادن

**کەڵە[2]:** ئاوەڵناو. ١. زەلام؛ گەورە ٢. درشت؛ زل ٣. لە سەر یەک دانراوی بەرزەوەبوو ٤. *[مەجاز]* ئازا و بەحورمەت ☰ ١. بزرگ ٢. دُرُشت ٣. تلنبار؛ برهم انباشتە ۴. شُجاع و محترم

⊡ **کەڵە کردن:** لە سەر یەک دانانی زۆر شت ☰ بر

هم انباشتن

**کەڵە**[۲]: دەنگ. وشەی دنەدنی گا بۆ سەر چێڵ 🇮🇷 کلمەی تحریکِ گاوِ گُشن

**کەڵە-**[۴]: پێشوشە. کەڵ ـ گەورە ‹کەڵەمێر؛ کەڵەپیاو› 🇮🇷 بزرگ

**. کەڵە**[۵]: پاشگر. ـ کەڵە؛ ـکەڵانە؛ بۆ خۆش ویستن و خۆش دواندن ‹سوورکەڵە؛ ژیکەڵە؛ خڕکەڵە؛ ناسکەڵە› 🇮🇷 پسوند تصغیر و تحبیب

**کەڵەئەموست / kełe'emust/**: ☜ **کەڵەئەنگوست**

**کەڵەئەنگوست / kełe'engust/**: ناو. کلکەکەڵە؛ کەڵەئەموست؛ کەڵەموست؛ قامکە گەورە 🇮🇷 انگشت شست

**کەڵەباب / kełebab/**: ☜ **کەڵەشێر**

⊡ **کەڵەباب بە لەپەوە لێنان**: *[کینایە]* دڵنیا بوون و لە خەم ڕەخسان 🇮🇷 خاطرجمع شدن

**کەڵەبابە / kełebabe/**: ناو. ١. وێنەی دیقل لە کانزا یان لە بەن و هەرچی بۆ جوانی ٢. ئێسکی ڕەقی قوڕقوڕوچکەی زۆرتر پیاوان ٣. ئامرازێکی مەکینەی دوورمانە، مەکووکە دەچێتە ناویەوە 🇮🇷 ١. مُجسمەی زینتی خروس ٢. سیب آدمی ٣. کمپلت

**کەڵەبچە / kełebçe/**: ☜ **کەڵەپچە**

**کەڵەبەندەن / kełebenden/**: ناو. چیای ڕژد و هەڵەمووت 🇮🇷 کوە و صخرەی دشوارگذر

**کەڵەپشکۆ / kełepişko/**: ناو. پەنگری زل؛ سکڵی درشت 🇮🇷 اخگر درشت

**کەڵەپیاو / kełep(i)yaw/**: ناو. کەڵەمێر؛ پیاوی ئازا و بەڕێز و جوامێر 🇮🇷 بزرگمرد

**کەڵەپیتاک / kełepîtak/**: ناو. باجی بە زۆر و ناهەقی 🇮🇷 باج زورکی

**کەڵەدار / kełedar/**: ناو. بڕەدار؛ زەنگەتلیش 🇮🇷 قطعەهیزم

**کەڵەرە / kełere/**: ناو. پێلشکێن؛ شەپۆلڕەوێن 🇮🇷 موجشکن

**کەڵەڕەش / kełeřeş/**: ☜ **قەلەڕەش**

**کەڵەز / kełez/**: ناو. کەڵەهەرز؛ جەنگەی تێبەربوونی بەران و نێرییە کێوی 🇮🇷 موسم جفتگیری بُز و گوسفند کوهی

**کەڵەزەڕ / kełezeř/**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* بێڕەحم و دڵڕەق (دەسەڵاتدار) 🇮🇷 سنگدل (حاکم)

**کەڵەزەڕی / kełezeřî/**: ناو. کاری بە زۆر و ناچاری 🇮🇷 کار زورکی

**کەڵەزەنگ / kełezeng/**: ناو. گازەنگ؛ زەنگی گەورەی کلیسا 🇮🇷 ناقوس

**کەڵەژ / kełej/**: ناو. قایمەمێو؛ داربەستی داری ڕەز 🇮🇷 وادیج؛ چوببست درخت مو

**کەڵەژن / kełejin/**: ناو. کەیوانووی بەڕێز و ژێهاتی 🇮🇷 کدبانوی لایق و مُحترم

**کەڵەس / kełes/**: ناو. ١. پەتی درێژ کە بە سەر چەما ڕاکێشراوە پێی دەپەڕنەوە ٢. کەڵەس؛ کەڵەک؛ چەپەرێ کە خراوەتە سەر کوندەی فووکراو بۆ پەڕینەوە 🇮🇷 ١. طناب عبور از رودخانە ٢. کلک عبور از آب

**کەڵەسوو / kełesû/**: ئاوەڵناو. ١. تایبەتمەندی چێڵێ کە لە بەر زۆر لێپەڕینی جوانەگایان جاڕز بووە ٢. تایبەتمەندی مانگایێ کە لە کەڵ ناچێتەوە و ئاوس نابێ 🇮🇷 ١. ویژگی مادە گاوی کە از جفتگیری زیاد بە ستوە آمدە باشد ٢. حالت مادە گاوی کە هموارە گُشن‌خواە است و آبستن نمی‌شود

**کەڵەش / kełeş/**: ئاوەڵناو. قەلاش؛ شەلاتی 🇮🇷 شارلاتان

**کەڵەشاخ / kełeşax/**: ناو. ١. باکێشی خوێن گرتن لە لەش؛ ئامرازی حەجامەت ٢. چەوریدان 🇮🇷 ١. بادکش حجامت ٢. ظرف چربی

**کەڵەشار / kełeşar/**: ناو. شارمازن؛ گەورەشار؛ شاری گەورە کە چەن شار دەگرێتە خۆ 🇮🇷 کلانشهر

**کەڵەشڤان** / keleş(i)van/: ناو. شوانی زۆر کارامە ☰ چوپان کارآمد

**کەڵەشینکە** / keleşînke/: ناو. بەرێکی دارمازوو ☰ از محصولات درخت مازو

**کەڵەشێر** / keleşêr/: ناو. کڵەشێر؛ کەرەشێر؛ کەرەشێل؛ کووک؛ کەرەباب؛ کەلەباب؛ کەڵەباب؛ کەڵەکووک؛ دیکل؛ دیقل ☰ خروس

▣ **کەڵەشێری کێوی**: قەرقاوڵ؛ چوڕ ☰ قرقاول

**کەڵەشێری مەرزە**: زیقاوە؛ زیقاوڵە ☰ خروس کولی

**کەڵەشێر ناوەخت**: ☜ **کەڵەشێری ناوادە**

**کەڵەشێری ناوادە**: کەڵەشێر ناوەخت: ١. کەڵەشێرێ کە لە ناوەختدا دەخوێنێ ٢. *[کینایە]* کەسی کاتنەناس کە لە وەخت و ناوەختدا دێتە قسە و دەبێتە ملۆزمی خەڵک ☰ ١و٢. خروس بی‌محل

**کەڵەشێرە** / keleşêre/: ناو. ١. کەڵەبابە؛ وێنەی کەڵەباب ٢. خورۆسەک؛ لارنژیت؛ نەخۆشییەکی سپەلاکی زارۆکانە، دەنگیان دەنووسێ و کۆخەی سەخت و وشکی دەگەڵدایە ٣. ئالوو؛ ئالگ؛ بادامە ☰ ١. مجسمەی زینتی خروس ٢. خروسک ٣. لوزە

**کەڵەشێرەخودایلە** / keleşêrexudayle/: ناو. پەپووسلێمانکە؛ پەپووسلێمانە ☰ هُدهُد

**کەڵەشێری** / keleşêrî/: ناو. گونەکەڵەشێری؛ جۆرێ هەنگووری دەنکزل و درێژە ☰ نوعی انگور دانه بلند

**کەڵەفندە** / kelefinde/: ناو. فیسقە؛ چۆڵەکەمشکە ☰ الیکائی

**کەڵەقەندی** / keleqendî/: ناوەڵناو. کۆڤک؛ قووتەکی؛ وەک ڕەحەتی ☰ مخروطی

**کەڵەک** / kelek/: ناو. ١. کۆما بەردی بە سەر یەکا دراو ٢. دیواری ئیشکەبەرد ٣. کەڵەس؛ کەرخ؛ چەپەری سەر کوندە بۆ پەڕینەوە ٤. تەڵەکە؛ حیلە ‹مەیگێڕ بە سەرت پەردی سیراتیش کەڵەکە/ سەیرانی بەهەشت سەیری دوو چاوی بەڵەکە! «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ٥. سوانە؛ پاسارە ☰ ١. توده سنگ انباشته ٢. دیوار سنگچین ٣. کلک عبور از آب ٤. نیرنگ ٥. لبه‌ی بام

▣ **کەڵەک بوون**: لە سەر یەک سوار بوونی زۆر شت ☰ تلنبار شدن

**کەڵەک کردن**: ١. لە سەر یەک دانان ٢. کۆ بوونەوەی چەند کەسێ لە دەوری یەک ٣. فێڵ کردن ٤. گیر کردنی پووکە لە لوولەی تفەنگ یا دەمانچەدا ٥. بە وشکەبەرد دیوار نان ☰ ١. بر هم انباشتن ٢. گرد هم آمدن ٣. نیرنگ به کار بردن ٤. گیر کردن پوکه در لوله‌ی تفنگ یا تپانچه ٥. دیوار سنگچین کردن

**کەڵەک لێ دان**: فێڵ کردن ☰ حُقه زدن

**کەڵەکباز** / kelekbaz/: ناوەڵناو. حیلەباز؛ فێڵاوی ☰ حُقه‌باز

**کەڵەکبوو** / kelekbû/: ناوەڵناو. شخلی؛ بەسەر یەکا هاتوو ☰ برهم انباشته

**کەڵەکچی** / kelekçî/: ☜ **کەڵەکەوان**

**کەڵەکۆتک** / kelekotik/: ناو. تەشتیلکەی دارینی کەچ و کرووچ ☰ تشتک چوبین

**کەڵەکوک** / kelekûk/: ☜ **کەڵەشێر**

**کەڵەکە** / keleke/: ناو. ١. ڕەوتی کۆ بوونەوەی خەڵک لە سەر شتێک ‹خەڵکێکی زۆر لەو شەقامە کەڵەکەیان کردووە، داوای کار دەکەن!› ٢. کەڵەک؛ فێڵ و تەڵەکە ☰ ١. گردهمایی پرشمار؛ تراکم جمعیت ٢. نیرنگ

▣ **کەڵەکە کردن**: لەسەریەک سوار بوونی زۆر شت ☰ بر هم تلنبار شدن

**کەڵەکەبڕێ** / kelekeb(i)řê/: ناو. گەمەیەکی لاوانە ☰ از بازی‌های جوانان

**کەڵەکەبڕێن** / kelekeb(i)řên/: ناو. چۆنیەتی خۆ

به سەر یەکدا دان و پاڵ پێوەنان ☰ فشار جمعیت

**کەڵەکەبەرد / kełekeberd/**: ناو. خزن ☰ سنگچین

**کەڵەکەترە / kełeket(i)re/**: ناو. حیساب کەرە؛ کەڵەگاترە: ١. خێزانە باڵندەیەکە لە تۆرەمەی ڕەشیشە، چەندین جۆریان هەیە ٢. باڵندەیەکە لە خێزانێ هەر بەم ناوە، ١٤,٥ سانتیمیترە، زۆر نائارامە و ئەملا و ئەولا دەکا و کلک پان دەکاتەوە و هەڵیدەتەکێنێ، پاشەڵی سپییە و سەری کلکی ڕەشە ☰ ١. چکچک ٢. چکچک کوهی

**کەڵەکەترە / kełeket(i)ře/**: ناو. *[کینایە]* ١. لە سەر یەک کەڵەکەکراوی لە ڕمان نزیک ٢. *[کینایە]* کارێ کە ناشێ سەرەنجامی هەبێ ☰ ١. اشیای برهم انباشتەی لرزان ٢. کار نافرجام

**کەڵەکەترێ / kełeket(i)řê/**: ناو. کاری خۆ بە سەر یەکدا دانی مرۆڤان بۆ کایە و شۆخی ☰ عمل به شوخی خود را بر روی یکدیگر انداختن

**کەڵەکەڵە[1] / kełekełe/**: ناو. ١. دۆخی کۆبوونەوەی جوانەگای زۆر لە سەر مانگابەکەڵ ٢. *[مەجاز]* پیاوانی گەورە ☰ ١. ازدحام گاوهای نر بر مادە گاو ٢. بُزرگمردان

**کەڵەکەڵە[2]**: دەنگ. وتەی دنە دانی جوانە گا بۆ سەر مانگای بە کەڵ ☰ کلمەی تحریک گُشن بر مادە گاو

**کەڵەکەوان / kełekewan/**: ناو. کەڵەکچی؛ کەڵەکی سەر ئاو ئاژۆ ☰ کلکران

**کەڵەکێوی / kełekêwî/**: ناو. کەڵەکێفی: ١. جۆرێ حەیوانە کێوی ٢. نێرییە کێوی ☰ ١. کل کوهی ٢. شاک کوهی

**کەڵەگا / kełega/**: ناو. ١. گا لە تەمەنی چوار تا شەش سالیدا و پێش خەسێنرانی ٢. گایەک کە سواری چێڵ دەبێ بۆ ئاوس کردنی ٣. *[پلار]* مرۆی ملهوڕ و زۆربێژ ٤. *[پلار]* مرۆی زل و زەبەلاح ☰ ١. گاو در سنین چهار تا شش سالگی ٢. گاو گشن ٣. آدم زورگو ۴. آدم لندهور

**کەڵەگاترە / kełegat(i)re/**: ☜ **کەڵەکەترە**

**کەڵەگایی / kełegayî/**: ناو. *[مەجاز، پلار]* زۆربێژی؛ زۆرەملی ‹کەڵەگایی لە کەس قبووڵ ناکەین› ☰ زورگویی؛ استبداد

**کەڵەگری / kełeg(i)rî/**: ناو. کاری گریانی بە کوڵ ☰ گریەی شدید

**کەڵەگژ / kełegij/**: ☜ **کەڵەگژژەو**

**کەڵەگژژەو / kełegijjew/**: دەنگ. کەڵەگژژەو؛ وشەیەکە لە کاتی کەڵ دانی جوانە گا دەیڵێن ☰ کلمەای برای تحریک گاو هنگام جفت‌گیری

**کەڵەگەت / kełeget/**: ناوەڵناو. بەقەوارە؛ چوارشانە؛ زەگوردە؛ بە قەڵافەتێکی درشت و بەهێزەوە ‹هیچ کورسییەک پیاوی بستەبالای پێ کەڵەگەت نابێ! «پەند»› ☰ هیکلدار

**کەڵەلان / kełelan/**: ناو. ١. شوێنێکی سروشتی لە بەندەناندا کە هێندە هەوراز و سەختە، بەس کەڵی لێ دەکەوێتەولە ‹جە کەڵەلانان هەر سم کۆشانەن/ جاسووسی چۆڵی سەیاد ڕۆشانەن «بەدبەخت»› ٢. تەوێڵە؛ پشتێر ☰ ١. جای بلند و دشوار گذر در کوه ٢. اصطبل

**کەڵەم / kełem/**: ☜ **کەڵەوە**

**کەڵەمباز / kełembaz/**: ناو. قەڵەمباز؛ بازی بڵند و هەراو ☰ پرش بلند

**کەڵەمبان / kełemban/**: ناو. هەمبانەی گەورە ☰ انبان بزرگ

**کەڵەمڕ / kełem(i)ř/**: ناو. تووکەبەر؛ بەر؛ مووی بەرگەدە ☰ موی زهار

**کەڵەمستێ / kełemistê/**: ☜ **کەڵەمستێن**

**کەڵەمستێن / kełemistên/**: ناو. کەڵەمستێ؛ ئەستیلان؛ پشکیلان؛ هەقلەمانی؛ هەقلیمەقۆ؛ قولەمشتێ ☰ گُل یا پوچ

**کەڵەموست / kełemust/**: ☜ **کەڵەنەنگوست**

**کەڵەموو / kełemû/**: ناو. ١. مووی درشت ٢. ناخوونەزێ؛ دووی‌پشک؛ چلک و ژانێکە لە نەرمەگۆشتی دەوری نینۆک پەیدا دەبێ، نێرتکی لە مووی ئەستوور دەکا ٣. کاری خڕ کردنەوەی خوری و مووی دە ناو ئاغەڵ ڕژاو ☰ ١. موی درشت ٢. کژدُمه؛ عقربک ٣. گردآوری پشم و موی ریخته در آغُل

**کەڵەمە / keleme/**: ناو. ١. ☜ کەڵەوە ٢. قەلەمەی چاندن ٣. تەنگ و چەڵەمە ☰ ١. ☜ کەڵەوە ٢. قلمه ٣. مُصیبت

⊡ **کەڵەمە کردن**: دەستەمۆ کردنی ڕەوەک ☰ رام کردن حیوان رموک

**کەڵەمێر / kelemêr/**: ☜ کەڵەپیاو

**کەڵەمێرو / kelemêrû/**: ناو. مێروولە عەجەمانە؛ مێروولەی سووری درشت ☰ مورچەی درشت

**کەڵەمێش / kelemêş/**: ناو. کەلمێش؛ کەڵمێش؛ تەپۆ؛ پێشکەی دندووک‌درێژ ☰ پشّەی مالاریا

**کەڵەن / kelen/**: ☜ کەڵەوە

**کەڵەنان / kelenan/**: ناو. چالی نە زۆر قووڵ ☰ چاله

**کەڵەنج / kelenc/**: ناو. جۆرێ بەری دارمازوو ☰ نوعی ثمر مازوج

**کەڵەنگ[1] / keleng/**: ناو. کالان؛ مەرەس؛ قەلادە؛ قایشی ملی تاژی ☰ قلاده

**کەڵەنگ[2]**: ناوەلناو. گەورە؛ پێگەیشتوو ‹خەجالەت نمەکێشی؟ پیا کەڵەنگیکی!› ☰ بزرگ؛ بالغ

**کەڵەوان / kelewan/**: ناو. شوانی کەڵەگامێشان ☰ چوپان گاومیش‌های نر

**کەڵەوانە / kelewane/**: ناو. ١. ☜ کەڵەوە ٢. قوبە؛ قوپچەی زل و زۆپ ☰ ١. ☜ کەڵەوە ٢. دُکمەی درشت گُنبدی

**کەڵەوە / kelewe/**: ناو. کلاوە؛ کولافە؛ کەرەوە؛ کەلمە؛ کەلەمەک؛ کەڵەم؛ کەڵەمە؛ کەڵەن؛ کەڵەوانە؛ ئاڵقەی دارینی ملی گا و گاگێرە ☰ چنبرەی گردن گاو

**کەڵەوەبەند / kelewebend/**: ناو. ویژانبەر ☰ سبنج‌بند یا یوغ

**کەڵەوەکێشی / kelewekêşî/**: ناو. */کینایە/* ١. دژایەتی؛ ڕقەبەری؛ بەربەرەکانی تێکەڵ بە دژمنی ‹ململانێ و کەڵەوەکێشی دەگەڵ یەکتر، خەباتەکەمان بەرەو کزی دەبات› ٢. سەرسەختی؛ چۆنیەتی بە قسە نەکردن ‹هاوپەیمانی بێ‌هێز سەر دێنێتە ڕێ، بەلام هاوپەیمانی بەهێز کەڵەوەکێشی دەکا و مل نادا› ☰ ١. رقابت کینه‌توزانه ٢. نافرمانی؛ سرکشی

**کەڵەوێ / kelewê/**: ناو. گیایەکی دڕکاوییە ☰ گیاهی خاردار

**کەڵەهەرز / keleherz/**: ☜ کەڵەز

**کەڵەهێڕ / kelehêř/**: ناو. ١. کۆ بوونەوەی جوانەگای زۆر لە سەر مانگای بەکەڵ ٢. */پلار/* گەلەکۆمە؛ کۆ بوونەوەی زۆر کەسی لە دژی تاکەکەسێک ☰ ١. ازدحام گاوهای نر بر ماده‌گاو ٢. ازدحام عده‌ای علیه کسی

**کەڵی / kelî/**: ناو. ١. کەلەس؛ کەلەس؛ کەڵەکی سەر ئاو ٢. */مەجاز/* ئازایەتی؛ بوێری ٣. کەلوو؛ بەری گیا کە چەند دەنکی بەڕیز تێدایە ☰ ١. کلک عبور از آب ٢. شُجاعت ٣. نیامک دانه

**کەڵیچە / keliçe/**: ناو. کەڵ‌گامێشی دوو ساڵ بەولاوە ☰ گاومیش دو سال به بالا

**کەڵین[1] / kelîn/**: ☜ کولان

**کەڵین[2]**: ناوەلناو. زل و زەبەلاح ☰ تنومند

**کەڵێز / kelêz/**: ناو. زەرگەتە؛ زەردەواڵە ☰ زنبور

**کەڵێن / kelên/**: ناو. کالانی چەرمی ☰ قلادەی چرمی

**کەم[1] / kem/**: ناو. کەو؛ بێژنگ ☰ غربال سوراخ درشت

**کەم**[٢]: ئاوەڵناو. کێم؛ کم؛ هندک؛ ئنج؛ جگلە؛ بە چەندێتییەکی خوارتر لە ڕادەی ئاساییەوە ‹پارەی کەم› ☰ کم؛ اندک

◘ **کەم بون**: ١. کەم بوونەوە؛ ڕوو لە کزی نان ٢. هندک بوون؛ کز بوون ☰ ١. کم شدن؛ کاهش یافتن ٢. کم بودن

**کەم بونەوە**: بەرەو کەمی چوون ☰ کاهش یافتن؛ کم شدن

**کەم کردن**: ١. لە زۆر کەم بوونەوە ‹بەفری ئەمساڵ لە چاو ساڵان کەمی کرد› ٢. کز و داڵگۆشت بوون ‹لە نەخۆشییەدا دە کیلۆم کەم کرد› ☰ ١. تقلیل یافتن ٢. لاغر شدن

**کەم کردنەوە**: ١. کەمەوە بوون ٢. تەوژم و گوڕی شتێ لاواز کردنەوە ☰ ١. کاهش یافتن؛ کم شدن ٢. کم کردن؛ پایین آوردن

**کەم**[٣]: ئاوەڵکار. پیچ؛ کم ‹کەم بڕوانە!؛ کەم بێ و بڕۆ!› ☰ اندک؛ کم

**کەمئاو** / kem'aw/: ئاوەڵناو. کەماو: ١. بە ڕادەی ئاوی کەمتر لە پێویست ٢. هەس؛ خەست ☰ ١. کم‌آب ٢. غلیظ

**کەمئاوەز** / kem'awez/: ئاوەڵناو. گێل؛ سەرشێت؛ سەفی؛ لاژگ ☰ کم‌خرد

**کەمئاوەزی** / kem'awezî/: ناو. گێلی ☰ کم‌خردی

**کەمئەرک** / kem'erk/: ئاوەڵناو. بارسووک؛ بارسۆک؛ سەرسووک ☰ کم‌دردسر

**کەمئەرکی** / kem'erkî/: ناو. سەرسووکی؛ سەرسڤکی ☰ کم‌کاری

**کەمئەندام**[١] / kem'endam/: ناو. کەمەندام؛ ئەو کەسەی بە هۆی کەمایەسییەک لە لەش، زەین یان دەروونیدا تووشی تێکچوونی ساغی و دابەزینی سەربەخۆیی لە ڕاپەڕاندنی کاروباری ژیانیدا دەبێ ☰ معلول

**کەمئەندام**[٢]: ئاوەڵناو. مقرۆ؛ کەمەندام؛ بە یەک یان چەند ئەندامی لەکارتە یا ناتەواوەوە ☰ معلول

**کەما** / kema/: ناو. کەمێ؛ کەمیر؛ هەنگوان؛ بەڕەژە؛ ئاڵفەگیایەکی خۆڕسکی کوێستانییە کە لە پاڵان دەڕوێ و خۆراکی چوارپێیە ☰ کما؛ گیاهی برگ سوزنی

**کەماجاڕ** / kemacar̄/: ناو. شوێنێ کەمای زۆری لێ ڕوابێ ☰ کمازار

**کەماچە** / kemaçe/: ☜ **کەمانچە**

**کەماخ** / kemax/: ناو. کلۆت؛ کەفەڵ ☰ کفل

**کەمازەنگ** / kemazeng/: ناو. جۆرێک کەمای کورتەباڵا ☰ نوعی کما

**کەماسا** / kemasa/: ناو. سواڵکەر؛ درێوزەکەر ☰ گدا

**کەمان** / keman/: ناو. کەڤان؛ کەوان؛ کەموو: ١. لبوودی؛ ئامرازێک بۆ تیر هاویشتن، بریتی لە چێو یان کانزایەکی هێندێک چەماوە کە دوو سەرەکەی بە ژێ توندکراوە ٢. ئامرازی شی کردنەوەی ڕیشاڵی خوری و پەمۆ، بریتی لە دارێکی گەورەی سەرچەماوە کە بە پەتێکی ئەستوور بەسراوەتەوە ٣. *[هێندەسە]* پاژێکی گەورە یان پچووک لە جەغز ٤. ☜ **کەمانچە** ☰ ١تا٣. کمان ٤. ☜ **کەمانچە**

**کەمانچە** / kemançe/: ناو. کەماچە؛ تاڵ؛ کەمان؛ شاشەک؛ مووزەن؛ میکەش؛ سازێکی ژێدارە بە شێوەی لەتەگۆیەک بە دەسکێکی باریکەوە کە چوارتاڵ تەلی پێوەیە و بە ئارشە دەژەنرێ، تایبەتی لوڕستانە و لەوێوە هاتۆتە نێو مووسیقای ئێران و دەوروبەرەوە ☰ کمانچە

**کەمانچەژەن** / kemançejen/: ناو. کەمانژەن؛ کەسێ کە کەمانچە دەژەنێ ☰ کمانچه‌نواز

**کەمانژەن** / kemanjen/: ☜ **کەمانچەژەن**

**کەمانگەر** / kemanger/: ناو. کەسێ کەمانان چێ دەکا ☰ کمانساز

**کەمانە / kemane/**: ناو. کەوانە ☰ کمانە

**کەماو / kemaw/**: ☜ **کەمئاو**

**کەمایەتی / kemayetî/**: ناو. کەمایی؛ کەمینە؛ بەشێ لە کۆمەڵگا یان دامەزراوەیەک کە ژمارەی ئەندامانی کەمتر لە بەشەکانی ترە ‹کەمایەتی ئایینی› ☰ اقلیّت

**کەمایەسی / kemayesî/**: ناو. کێماتی؛ کێماسی؛ کێمایی: ١. ئاتاجی؛ دەسکورتی ٢. کەم و کووڕی و ناتەواوی ‹هێز و توانام ڕۆژبەڕۆژ لە کەمایەسیدایە «هێمن»› ☰ ١. احتیاج ٢. کم و کاستی

**کەمایی[١] / kemayî/**: ☜ **کەمایەتی**

**کەمایی[٢]**: ئاوەڵکار. هیچنەبێ؛ بەشی کەم؛ لای کەم ☰ اقلاً

**کەمباخ / kembax/**: ☜ **کامباخ**

**کەمباران / kembaran/**: ئاوەڵناو. وشک؛ ئیشک ☰ خُشک

**کەمبارە / kembare/**: ئاوەڵناو. کەمفایدە ☰ کم‌بهره

**کەمبایەخ / kembayex/**: ئاوەڵناو. خراپۆچکە؛ فەرعی؛ بێکەڵک ☰ کم‌ارزش

**کەمبڕشت / kembiřişt/**: ئاوەڵناو. بێبڕ؛ کەمدەرامەت ☰ بی‌حاصل

**کەمبڵێ / kemb(i)łê/**: ئاوەڵناو. بێدەموزمان؛ بێدەمودوو؛ کەمقسە ☰ کم‌حرف

**کەمبەخت / kembext/**: ئاوەڵناو. مرووچ؛ چارەڕەش ☰ بدشانس

**کەمبەر / kember/**: ناو. ١. کەمەر؛ ناوقەد ٢. پشتێنی زێڕ یان زێو ٣. گوڵێکی دەشتییە ☰ ١. میان؛ کمر ٢. کمربند زینتی ٣. از گل‌های صحرایی

**کەمبەر / kem ber/**: ئاوەڵناو. تەسک؛ بەرانبەری پان ☰ کم‌عرض

**کەمبەرکێ / kemberkê/**: ناو. کێ کەمتر؛ جۆرێ کڕین کە فرۆشیاران بانگهێشت دەکرێن، کێ هەرزانتری بدا، لەوی دەستێنن ☰ مُناقصه

**کەمبەرۆک / kemberok/**: ناو. دەوەنێکی بە چقڵە، میوەیەکی هەیە ☰ خاربنی میوه‌دار

**کەمبەرە / kembere/**: ناو. ١. پشتێنی خشڵ ٢. کەمەر؛ ناوقەد ☰ ١. کمربند زینتی ٢. میان

**کەمبەل / kembel/**: ☜ **کەمێڵە**

**کەمبەلۆک / kembelok/**: ناو. ١. ☜ **کارگ ـ١** ٢. چمە؛ دنبەلان ☰ ١. ☜ **کارگـ١** ٢. دُنبلان

**کەمبین / kembîn/**: ئاوەڵناو. چاوکز؛ کوورەک؛ کتوکوێر ☰ کم‌سو (چشم)

**کەمپ / kemp/**: ناو. ئوردووگا ☰ اردوگاه

**کەمپشت / kempişt/**: ئاوەڵناو. کۆتەر؛ قرخ ☰ کم رشد (موی سر)

**کەمپشوو / kemp(i)şû/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* بهن‌تنگ؛ زوو هەڵچوو ☰ کم‌حوصله؛ آتشی‌مزاج

**کەمپەر / kemper/**: ناو. ١. ڕکەبەری؛ کاری خۆ ڕانان لە حاند یەکێکی تر ٢. بەراوەرد؛ هەڤبەری؛ کار و ڕەوتی هەڵسەنگاندن ☰ ١. رقابت ٢. مُقایسه

**کەمپەراندن / kemperandin/**: چاوگ. ١. ڕکەبەری کردن ٢. بەرامبەر کردن؛ هەڵسەنگاندن؛ نیشان دانی وێکچوویی و جیاوازی چەن کەس، شت یا بارودۆخ لە حاندی یەکتر ☰ ١. رقابت کردن ٢. مُقایسه کردن

**کەمپەری / kemperî/**: ئاوەڵناو. کامپەری؛ بەراوەردی؛ لێکنەهانی؛ موقایەسەیی؛ سەر بە پێک هەڵسەنگان و لە بەر یەک ڕانان ‹زمانناسیی کەمپەری› ☰ مُقایسه‌ای

**کەمپین / kempîn/**: ناو. هەڵمەت ‹کەمپینی بانگەشەی هەڵبژاردن› ☰ کارزار

**کەمپیوتەر / kemp(i)yuter/**: ناو. کامپیوتر؛ خێراکار؛ دەزگایەکی ئیلکترۆنیکی کە بۆی دەبێ بەرنامەڕێژی لە سەر بکرێ و زانیاری لە سەر هەڵگیرێ و تەنانەت ماشین و دەزگای تری پێ

بەڕێوە بچێ ☰ کامپیوتر؛ رایانە

**کەمپیۆتەر** / kemp(i)yoter/: ناو. خێراکار ☰ رایانە؛ کامپیوتر

**کەمت** / kemt/: ناو. قوبە؛ دوگمەی قەبە ☰ دُکمەی قُبەای

**کەمتا** / kemta/: ئاوەڵناو. نادر؛ کەموێنە ☰ کم‌نظیر؛ نادر

**کەمتار** / kemtar/: ناو. کەمتیار؛ کەلەکەمتار؛ قەمتار؛ قەنتار؛ کەفتار؛ کەفتارۆ؛ کەفتیار؛ کەڤتار؛ کەوتێر؛ گۆڕنەباش؛ گۆڕهەڵکەنە؛ کفن‌دز؛ قین‌شەلە؛ دەستە گیانەوەرێکی گواندار، گۆشتخۆر، شەوگەڕ، سەرزل، ددان‌سفت و شەویلکە بەهێز و دەست لە حاندی پا درێژترن کە زۆرتر کەلاک دەخۆن ☰ کفتار

**کەمتاکورت** / kemtakurt/: ئاوەڵکار. کەم و بێش؛ کەم تا زۆر ‹کەم‌تاکورت حالیم کرد نیازم چییە› ☰ کم و بیش

**کەمتاکورتێ** / kemtakurtê/: ئاوەڵکار. کەمێ لە زۆرێ؛ کەم و بێشێ ‹کەم‌تاکورتێ تێگەیشتم چی دەوێ› ☰ کم و بیشی

**کەمتر** / kemtir/: ئاوەڵکار. کەمێر ‹کەمتر ڕێم دەکەوێتە بازاڕ› ☰ کمتر

**کەمتەرخ** / kemterx/: ئاوەڵناو. بێ‌بەها؛ ناڕەواج ☰ بی‌ارزش

**کەمتەرخەم** / kemterxem/: ئاوەڵناو. کەترەخەم؛ گوێ‌نەدەر؛ کار پشت‌گوێ‌خەر ☰ سهل‌انگار

**کەمتەرخەمی** / kemterxemî/: ناو. کەترەخەمی: ١. ئاسان‌گری و پێداگر نەبوون ‹دەست لەم کەمتەرخەمییە هەڵگرە و شانی بۆ شل کە!› ٢. دۆخی نەبوونی سەرنج و چاوەدێری شیاو و پێویست ‹کەمتەرخەمی لە جێبەجێ کردنی یاساکانی هات‌وچۆ› ☰ ١و٢. سهل‌انگاری

**کەمتیار** / kemt(i)yar/: ☜ **کەمتار**

**کەمتین** / kemtîn/: ئاوەڵناو. بێ‌تاقەت؛ بێ‌تابشت ☰ ناتوان

**کەمجیقڵدان** / kemcîqiłdan/: ☜ **کەمجیقڵدانە**

**کەمجیقڵدانە** / kemcîqiłdane/: ئاوەڵناو. [مەجاز، پلار] کەمجیقلدان؛ کەمچیکلدانە؛ تەنگەجیقەڵدان؛ بێ‌سەبر و حەوسەلە ☰ ناشکیبا

**کەمجیقەڵدان** / kemcîqełdan/: ئاوەڵناو. [کینایە] کەمجیکەڵدان؛ کەمجیگڵدانە؛ زووتۆر؛ تۆرینۆک ☰ زودرنج

**کەمجیکەڵدان** / kemcîkełdan/: ☜ کەمجیقەڵدان

**کەمجیگڵدانە** / kemcîgiłdane/: ☜ کەمجیقەڵدان

**کەمچ** / kemç/: ئاوەڵناو. خێچ؛ چەفت؛ چەوێڵ ☰ کج

**کەمچک** / kemçik/: ☜ **کەوچک**

**کەمچگ** / kemçig/: ☜ **کەوچێز**

**کەمچە** / kemçe/: ناو. ١. ☜ **کەوچک** ٢. ماڵە؛ هەسک؛ هەسکێ؛ ئامێرێکی دەستی چکۆلە بریەتی لە رووپەڕێکی سێ‌سووچی کانزایی بە دەستەیەکی بەرزەوە، بەنایان بۆ هەڵگرتن و پەستاوتن و تەخت کردنی قوڕ و مەلات بە کاری دەبەن ٣. داغی ئاژەڵ و وڵسات ☰ ١. ☜ **کەوچک** ٢. کمچەی بنایی ٣. داغ دام و احشام

**کەمچەقوڵە** / kemçequłe/: ☜ **کەچکەقوڵە**

**کەمچیکڵدانە** / kemçîkiłdane/: ☜ **کەمجیقڵدانە**

**کەمحوکم** / kemĥukm/: ئاوەڵناو. کز ☰ کم‌سو (چشم)

**کەمخوێ** / kemx(i)wê/: ئاوەڵناو. شیرینخوێ ☰ کم‌نمک

**کەمخۆر** / kemxor/: ئاوەڵناو. کێمخۆر؛ کەم‌قنیات؛ دژی زۆرخۆر. هەروەها: **کەمخۆری** ☰ کم‌خور

**کەمخە** / kemxe/: ناو. پارچەیەکی ئاورێشمییە ☰

پارچەی ابریشمین

**کەمخەرج** / kemxerc/: ئاوەڵناو. هاسانبژێو 🇮🇷 کمخرج

**کەمدڵ** / kemdił/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دڵناسک؛ خۆڕانەگر لە هەمبەر کوڵ و کەسەر و ئازارەوە 🇮🇷 دلنازک

**کەمدۆ** / kemdo/: ئاوەڵناو. ١. تایبەتمەندی کەسێ کە ئاژەڵی شیردەری کەمە ٢. کەمشیر (مانگا) 🇮🇷 ١. ویژگی کسی کە دام دوشیدنی کم دارد ٢. کمشیر (گاو)

**کەمدوو** / kemdû/: ئاوەڵناو. کەمقسە 🇮🇷 کمحرف

**کەمدەس** / kemdes/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ١. دەستەنگ ٢. بێدەسەڵات 🇮🇷 ١. تنگدست ٢. ناتوان

**کەمدەست** / kemdest/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دەستتەنگ؛ نەدار. هەروەها: **کەمدەستی** 🇮🇷 تنگدست

**کەمدەم** / kemdem/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* شێنەیی لە خواردندا 🇮🇷 کُند در غذا خوردن

**کەمر** / kemr/: ناو. ١. کەڤر؛ بەرد؛ کوچک ٢. خەڵووزەبەردینە 🇮🇷 ١. سنگ ٢. زُغالسنگ

**کەمران** / kemran/: ناو. کانگای خەڵووزەبەردینە 🇮🇷 معدن زُغالسنگ

**کەمراندن** / kemrandin/: چاوگ. سوور کردنەوە (گۆشت) 🇮🇷 سرخ کردن (گوشت)

**کەمراوێژ** / kemrawêj/: ناو/ ئاوەڵکار. پیچەک ل زەحف؛ کەم لە زۆر 🇮🇷 کم تا بیش

**کەمرە** / kemre/: ناو. کەپرە؛ گەمرە؛ گەرمە؛ ڕیخی بەرپێدراوی ڕەقهەڵاتوو 🇮🇷 سرگین کوبیدەی سفتشده

**کەمرین** / kemrîn/: چاوگ. سوور کرانەوە (گۆشت) 🇮🇷 سُرخ شدن (گوشت)

**کەمڕوو** / kemřû/: ئاوەڵناو. کەمڕی؛ شەرمن؛ شەرمێون 🇮🇷 خجالتی؛ کمرو

**کەمڕوویی** / kemřûyî/: ناو. ڕوودەربایسی؛ شەرمنی 🇮🇷 کمرویی

**کەمڕەنگ** / kemřeng/: ئاوەڵناو. کاڵ 🇮🇷 کمرنگ

**کەمڕی** / kemřî/: ☜ **کەمڕوو**

**کەمڕێژەو** / kemřêjew/: ئاوەڵناو. کێمبەر 🇮🇷 کمحاصل

**کەمزات** / kemzat/: ئاوەڵناو. دڵزراڤ؛ ترسەنۆک 🇮🇷 ترسو

**کەمسەر** / kemser/: ئاوەڵناو. ١. نزیک لە تەواو بوون ٢. کەمژمارە؛ بە جەماوەری کەم (خێزانی کەمسەر) 🇮🇷 ١. رو بە اتمام ٢. کمجمعیت

**کەمشۆ**[1] / kemşo/: ناو. کەری بارەبەر 🇮🇷 اُلاغ

**کەمشۆ**[2]: ئاوەڵناو. *[پلار]* زەلامی ناتێگەیشتوو؛ دەبەنگ 🇮🇷 نفهم

**کەمشیر** / kemşîr/: ئاوەڵناو. بێشیر؛ کوێرگوان 🇮🇷 دارای شیر کم و ناکافی

**کەمفام** / kemfam/: ئاوەڵناو. دڵکۆر؛ قەوچ؛ گێلە؛ هشسفک 🇮🇷 کمفهم

**کەمفایدە** / kemfayde/: ☜ **کەمبارە**

**کەمفرۆش** / kemf(i)roş/: ئاوەڵناو. ترازووباز؛ تەرازووباز؛ سووکفرۆش 🇮🇷 کمفروش

**کەمقسە** / kemq(i)se/: ئاوەڵناو. بێدەموزمان؛ دژدوێن؛ نتم 🇮🇷 کمحرف

**کەمقنیات** / kemqinyat/: ئاوەڵناو. ١. بە کەم ڕازی ٢. ☜ **کەمخۆر** 🇮🇷 ١. قانع ٢. ☜ **کەمخۆر**

**کەمقووڵ** / kemqûł/: ئاوەڵناو. تەننگ؛ تەنک 🇮🇷 کمعُمق

**کەمقەدر** / kemqedr/: ئاوەڵناو. ناقابیل 🇮🇷 بیارزش

**کەمقەوارە** / kemqeware/: ئاوەڵناو. بچکۆک؛ چکۆلە؛ بیچک؛ بچووک؛ گچکە 🇮🇷 کوچک

**کەمقەوارەیی** / kemqewareyî/: ناو. *[کینایە]* بچووکی؛ خزمەتکاری و نۆکەری 🇮🇷 خدمتگزاری

**کەمک**[1] / kem(i)k/: ناو. دەسڕۆکەی دەست و

لووت سڕین 🇮🇷 دستمال

**کەمک**[٢]: ئاوەڵناو. سەروچاو چکۆڵە 🇮🇷 دارای رخسار کوچک

**کەمکار / kemkar**: ئاوەڵناو. ١. تایبەتمەندی کەسێ ئیشی کەم دەس کەوێ ٢. تایبەتمەندی کەسێ توانا یا کاتی کەمی بۆ کار کردن هەیە ٣. تەمەڵ و بێکارە 🇮🇷 ١. کم‌کار ٢. ویژگی کسی که کم کار می‌کند ٣. تنبل

**کەمکاری / kemkarî**: ناو. ١. چۆنیەتی کەمکار بوون ٢. کەمتەرخەمی 🇮🇷 ١. کم‌کاری ٢. کوتاهی

**کەمکراو / kemk(i)raw**: ئاوەڵناو. دەرکراو؛ دەرکریاگ؛ دەرکریاو 🇮🇷 منها شده

**کەمکراوەوە / kemk(i)rawewe**: ئاوەڵناو. هندکاندی؛ کەمەوکریاگ 🇮🇷 کاسته شده

**کەمکردوو / kemkirdû**: ئاوەڵناو. زاف‌نەمەند 🇮🇷 کاسته

**کەمکولۆت / kemkulot**: ئاوەڵناو. کۆن و لەکارکەوتوو 🇮🇷 کُهنه و ازکارافتاده

**کەمکۆڵ / kemkoł**: ناو. ١. تێخوڵی شینی گوێز ٢. گیایەکی دڕکاوییە 🇮🇷 ١. پوستەی سبز گردو ٢. گیاهی خاردار

**کەمکۆڵی**[١] **/ kemkołî**: ناو. ڕەنگی قاوەیی تۆخ 🇮🇷 رنگ قهوەای سیر

**کەمکۆڵی**[٢]: ئاوەڵناو. بە ڕەنگی قاوەیی تۆخ 🇮🇷 به رنگ قهوەای سیر

**کەمکووڕی / kemkûřî**: ناو. دەخس؛ دەخەز؛ دەخەس؛ دەغەز؛ کەمایەسی 🇮🇷 نُقصان

**کەم ـ کەم**[١] **/ kem kem**: ئاوەڵناو. کێم ـ کێم؛ کەمە ـ کەمە؛ کێم‌کێمە ‹بەفری کەم ـ کەم› 🇮🇷 اندک ـ اندک

**کەم ـ کەم**[٢]: ئاوەڵکار. کێم ـ کێم؛ کەمە ـ کەمە؛ کێم‌کێمە؛ هێدی ـ هێدی ‹کەم ـ کەم دەم دەکاتەوە› 🇮🇷 اندک ـ اندک

**کەمکەمە / kemkeme**: ئاوەڵکار. کەم ـ کەم ‹بەو قسە خۆشانەوە سەرگەرمی دەکەی/ وردە ـ وردە، کەم‌کەمە نەرمی دەکەی «هێمن»› 🇮🇷 اندک ـ اندک

**کەملتە / kem(i)lte**: ناو. کەستەک؛ سندەگل؛ کلۆی گڵ 🇮🇷 کلوخ

**کەممو / kemmû**: ئاوەڵناو. گولیک؛ سەرتەنک 🇮🇷 کم‌پشت

**کەممیوە / kemmîwe**: ئاوەڵناو. کێمبەر 🇮🇷 کم‌حاصل

**کەمنرخ / kemnirx**: ئاوەڵناو. هەرزان؛ هەرزانبایی 🇮🇷 کم‌بها

**کەمنوێژ / kemn(i)wêj**: ئاوەڵناو. حشکەنمێژ؛ نوێژکەهاڵ 🇮🇷 سهل‌انگار در نماز خواندن

**کەم و بێش / kem û bêş**: ☜ **کەم‌تاکورت**

**کەمور / kemur**: ناو. ١. گاشە بەرد ٢. کەمر؛ بەرد؛ کوچک 🇮🇷 ١. سنگ بزرگ ٢. سنگ

**کەموسکە / kemuske**: ئاوەڵناو. قیچ؛ پیچ 🇮🇷 اندک

**کەموسکەیێ / kemuskeyê**: ئاوەڵکار. هەبەک؛ پیچەک 🇮🇷 اندکی

**کەموکورتی / kem û kurtî**: ناو. عەلەم؛ کەمایەسی 🇮🇷 کاستی؛ نقص

**کەموکوڕ / kem û kûř**: ئاوەڵناو. نیوەچڵ؛ ناتەواو؛ دوایی نەهاتوو 🇮🇷 ناتمام

**کەموکووڕی / kem û kûřî**: ناو. کێم‌وکووڕی؛ ناتەواوی؛ نیوەچڵی 🇮🇷 ناتمامی

**کەمولە / kemule**: ☜ **کەمۆڵە**

**کەموێنە / kemwêne**: ئاوەڵناو. دەگمەن؛ ناوێرە 🇮🇷 کمیاب

**کەمۆ**[١] **/ kemo**: ناو. کۆدک؛ کاسەی دارینی زل 🇮🇷 کاسەی چوبین بزرگ

**کەمۆ**[٢]: ئاوەڵناو. زرنگی فێڵزان 🇮🇷 زرنگ حقّه‌باز

**کەمۆت / kemot**: ئاوەڵناو. پەلپگر؛ سەرڕەق 🇮🇷 لجباز

**کەمۆتەر / kemoter/**: ☜ **کۆتر**[1]
**کەمۆکە / kemoke/**: ئاوەڵناو. سـووک؛ سفـک: سۆک؛ سفک؛ سووکەڵە؛ بە کێشی کەم ف سبُک
**کەمۆلە / kemole/**: ☜ **کەمۆڵە**
**کەمۆڵە / kemołe/**: ناو. کەمۆلە؛ کەمولە؛ کاسـەی دارینی پچووک ف کاسەی چوبین کوچک
**کەمو / kemû/**: ☜ **کەمان**
**کەموتر / kemûtir/**: ☜ **کۆتر**[1]
**کەموترە / kemût(i)re/**: ناو. دووکەڵکێش؛ دووکەلگیر؛ دوودکێش ف دودکش
**کەموتەر / kemûter/**: ☜ **کۆتر**[1]
**کەموسکە / kemûske/**: ئاوەڵکار. کەمووکـە؛ برووکە؛ پیچەک ف اندکی
**کەموسکەیەک / kemûskeyek/**: ئاوەڵکار. چکێ؛ قنچـک؛ میچالـەک؛ تانێ ‹کەمووسـکەیەک پەنەمووس بکە!› ف اندکی
**کەموسکەیی / kemûskeyî/**: ناو. کەمی؛ هێندکی؛ کەمووکەیی؛ دژی زافی ف کمی؛ کاستی
**کەموک / kemûk/**: ئاوەڵناو. چکەلانـە؛ چکەلانینـە ف اندک
**کەموکە / kemûke/**: ☜ **کەموسکە**
**کەموکەیی / kemûkeyî/**: ناو. کـەمی؛ هێنـدکی؛ کەمووسکەیی؛ دژی زافی ف کمی؛ کاستی
**کەموکەیێ / kemûkeyê/**: ئاوەڵکار. نـەختێ؛ نـەختێک؛ کـەمێ ‹کەمووکـەیێ تـووم هەیـە بـۆم نافرۆشرێ› ف اندکی
**کەمە / keme/**: ناو. کەوانـە: ١. هـەر دارێ کـە جەغزی یان نیوەجەغزی چەمێنرابێتەوە (بۆ دەورە گـرتنی ئامرازێـک وەک کەڵلـەبێژنگ و داری خوارەوەبووی بێشکە و دەوری پێچکـەی عەرەبانـە و ...) ٢. ئـامرازێ کـە داری بـۆ کەمـە پـێ دەچەمێننەوە ٣. چەمەی هەر شـتێکی چـەماوە ‹کەمەی داس› ف ١. چنبره؛ چوب خمیدەی دایره یـا نیم‌دایره‌ای ٢. ابزار کمانی کردن چوب ٣. خم؛ قسمت کمانی هر چیز
**کەمەر / kemer/**: نـاو. ١. نێـوان؛ ناوقـەد ٢. تیشەشاخ ‹وەختەن شەقایق سەر باوەرۆ بەر/ هۆردۆ ئـالای سـوور جـە بـالای کەمـەر «سـەیدی»› ٣. کوچکەبەرد؛ خڕکەبەرد ف ١. میـان؛ کمـر ٢. کـوه تمام سنگی ٣. قلوەسنگ
**کەمەربەست / kemerbest/**: ناو. نۆکەر؛ خزمـەتکار ف نوکر
**کەمەربەستە / kemerbeste/**: ناو. *[کنایە]* پەنابەر ف پناهنده
**کەمەربەن / kemerben/**: ☜ **کەمەربەند**
**کەمەربەند / kemerbend/**: نـاو. کەمەربـەن؛ پشتان؛ پشتێنی لە قامیش ف کمربند
**کەمەربەندی[1] / kemerbendî/**: نـاو. **پشـتێندە؛** پشتێنە؛ دەورە؛ ئـەوەی وەکـوو پشـتوێن دەوری شتێک دەگرێ ف کمربند
**کەمەربەندی[2]**: ئاوەڵناو. کەمەربـەنی؛ بـە دۆخ و چۆنیەتی دەوردانـەوە ‹جـادەی کەمەربەنـدی› ف کمربندی
**کەمەرچین / kemerçîn/**: ناو. کـراس یـان کـەوای ژنانەی ناوقەد قرچێنراوی چیندار ف لبـاس کمـر چیندار زنانه
**کەمەردوخ / kemerdux/**: ناو. دەزووی بە خەرەک ڕێسراو ف رشتەی چرخ دوکریسی
**کەمەرکەش / kemerkeş/**: نـاو. ١. دەسـتە و سەرەژوورە؛ ئامال هەوراز ٢. جۆرێ دەرپێ ف ١. کمرکش ٢. نوعی زیرشلواری
**کەمەرن / kemerin/**: ئاوەڵناو. بەردەلان؛ بـەردانی؛ شاوانی ف سنگلاخی
**کەمەرە / kemere/**: ناو. ١. کەمبەرەی خشڵ ‹ئای لە بازنان، ئای لە بازنان/ ئای لـە تیپـی کەمـەرەداران «فولکلۆر»› ٢. ئوسـتوا؛ ناوقـەدی زەمـین ٣. نـاو

قەدی هەر شتێ ٤. جێگەی بانگدەر لە سەر منارە ٥. تەختەی لە دۆلاش دراو ٦. گاشە بەرد؛ تەلەسەنگ ▪ ١. کمربند زینتی ٢. استوا ٣. میان ۴. گُلدستەی منارە ۵. تختەای کە بر ناو آسیا کوبیدە شود ۶. سنگ بزرگ

**کەمەرەشل** / kemereşil/: ناو. [کینایە] ئافرەتی جوان و لەڤەند ‹نازت بێ و نازت، کەمەرەشل نازت/ سەرشیوی سەڤز بێتە پێشوازت «فولکلۆر»› ▪ دختر زیبا و لَوَند

**کەمەسا** / kemesa/: ناو. سوالکەر؛ دەرۆزەکەر ▪ گدا

**کەمەک** / kemek/: ناوەلکار. کمەک؛ تۆزێک ▪ اندکی

**کەمە ـ کەمە** / keme keme/: ☜ کەم ـ کەم

**کەمەکێ** / kemekê/: ناوەلکار. کەمەک؛ تۆزێک ▪ اندکی

**کەمەن** / kemen/: ☜ کەمەند

**کەمەنبەسەرێ** / kemenbeserê/: ناو. یارییەکی لاوانی گوندنشینە ▪ از بازی‌های جوانان روستایی

**کەمەند** / kemend/: ناو. کەمەن: ١. پەتی درێژ بۆ گرتنەوە و بەستنی ڕاکردوو ٢. پەتی سەر بە ئالقەی فرەوان ▪ ١و٢. کمند

**کەمەندام** / kemendam/: ☜ کەمئەندام

**کەمەندهاوێژ** / kemendhawêj/: ناو. سوارێ کە بە کەمەند دوژمن یان ڕاکردوو دەگرێ ▪ کمنداانداز

**کەمەی**[1] / kemey/: ناو. هەژاری؛ بەلەنگازی؛ نەداری ▪ نداری

**کەمەی**[2]: ناوەلکار. کەمێک؛ تۆزێک؛ نەختێک؛ چکێ ▪ اندکی

**کەمەیی** / kemeyî/: ناوەلناو. خڕ ▪ دایرموار؛ حلقوی

**کەمهۆش** / kemhoş/: ناوەلناو. بیربلاو ▪ حواس‌پرت

**کەمهێز** / kemhêz/: ناوەلناو. لاهێز؛ بێ‌تاقەت ▪ کم‌توان

**کەمی** / kemî/: ناو. هێندکی؛ کەمووکەیی؛ کەمووسکەیی؛ دژی زافی ▪ کمی؛ کاستی

**کەمیر** / kemîr/: ☜ کەما

**کەمیک** / kemîk/: ناو. کەفی؛ کەفیک؛ دەسەسڕ ▪ دستمال

**کەمین** / kemîn/: ناو. ١. مەلاس؛ مەلاز؛ کاری خۆ حەشار دان بۆ هوروژمی لەپڕ و ناکاو ٢. بۆسە؛ خەل حەشارگە؛ سیپە؛ ڕەبەت؛ کەمینگا؛ مردە و زیندە ▪ ١. کمین ٢. کمینگاه

**کەمینگا** / kemînga/: ناو. بۆسە؛ حەشارگە؛ ڕەبەت ▪ کمینگاه

**کەمینە**[1] / kemîne/: ☜ کەمایەتی

**کەمینە**[2]: ناوەلکار. کەمایی؛ لای کەم ▪ اقلاً

**کەمێ** / kemê/: ☜ کەمێک

**کەمێر** / kemêr/: ناوەلکار. کەمتر ▪ کمتر

**کەمێک** / kemêk/: ناوەلکار. کەمێ؛ کەمەکێ؛ کەمەک؛ نەختێ؛ چکێ ▪ اندکی

**کەمێل** / kemêl/: ☜ کەمێلە

**کەمێلە** / kemêle/: ناو. کەمێل؛ کەمبەل: ١. سلەمەڕی بە پشت دووگەوە لکاوی پەز کە وەک زەنگۆلە لەرەی دێ ٢. پەترۆک؛ پترۆی برین ٣. [ئاشیرین] چلمی وشکەوەبوو بە لووتەوە ▪ ١. گال؛ پوستگالە ٢. خشک‌ریشە ٣. خُلم؛ ان‌دماغ

**کەن**[1] / ken/: ناو. ١. خەنە؛ پێکەنین ٢. ☜ **کانگا-١** ٣. جێگەی کۆلدراو؛ شوێنی هەلکەنراو ٤. ئاودڕ؛ کەندال؛ ئەو شوێنە ئاو هەلیدڕیوە ٥. بەرزایی لە چاو دەوروبەری ٦. کارێ جل لە خۆ کردن؛ لیباس کەندن ٧. کرێژی سەر ▪ ١. خندە ٢. ☜ **کانگا-١** ٣. جای کندەشدە ۴. آبکند ۵. بُلندا ۶. عمل کندن لباس ۷. شورەی سر

**ـ کەن**[2]: پاشەوشە. ١. بەرەلداکەر ‹ترکەن؛ تسکەن› ٢. هەلکەن؛ کۆلەر ‹چالکەن؛ قەورکەن› ٣.

داکەن ‹کراس‌کەن؛ کەوشکەن› ٤. خەنە؛ کـەنین؛ پێکەنین ‹زەردەکەن› ⚑ ١. ـ زن ٢. ـکن؛ بردارنده ٣. درآورنده ۴. خنده

**کەنار / kenar/**: ناو. ١. ڕەخ؛ قەراخ؛ قـەراغ؛ ئـالی؛ لا؛ تەنشت ٢. ☜ **کونار** ٣. دەوەنێکە بۆنخۆش ٤. ☜ **کنـارین**[١] ⚑ ١. کنـار ٢. ☜ **کونـار** ٣. درختچەای خوشبو ۴. ☜ **کنارین**[١]

⊡ **کەنار گرتن**: دوورەپەرێز بـوون ‹دوای ڕاپـەڕین کەناری گرت› ⚑ کنارەگیری کردن

**کەناراو / kenaraw/**: نـاو. ١. بەسـتێن؛ قـەراخی ڕووبار ٢. ☜ **کناراو** ⚑ ١. کنارەی رودخانە ٢. ☜ **کناراو**

**کەنارە / kenare/**: ناو. کنارە: ١. دەوری بـەحر ٢. قالی درێژوکە ٣. پەراوێز ⚑ ١. کرانە ٢. قالی کنارە ٣. حاشیە

**کەنارەسواو / kenares(i)waw/**: ئاوەڵـناو. لاخـوراو ‹قالی کەنارەسواو› ⚑ پهلوساییده

**کەنارەگیر / kenaregîr/**: ئاوەڵـناو. دوورەپـەرێز. هەروەها: **کەنارەگیری** ⚑ کنارەگیر

**کەنارەوکەنار / kenare w kenar/**: ئاوەڵـکار. پەڕانپەڕ؛ دەوراندەور ⚑ پیرامون

**کەناری / kenarî/**: نـاو. ١. دڕکـەزی؛ دڕووی پەرژین ٢. پەرژین؛ پەرچین ٣. قەناری ⚑ ١. خار پرچین ٢. پرچین ٣. قناری

**کەنامپەر / kenamper/**: ناو. کەنگری وشکەوەکراو ⚑ کنگر خشک‌شده

**کەناندن / kenandin/**: چـاوگ. خەنانـدن؛ وە پێکەنین هێنان ⚑ به خنده آوردن

**کەناو**[١] **/ kenaw/**: ناو. ئاودڕ؛ کەندال ⚑ آبکند

⊡ **بۆ کەناو گەڕیان**: /کینایە/ زۆر بێ‌هێز و لاواز و لە مردن نزیک بوون ‹بەستەزمانە هیچی لێ نەماوە، بۆ کەناو ئەگەڕێ› ⚑ در شُرُف مرگ بودن

**کەناو**[٢]: ئاوەڵناو. هەڵکەنراو؛ کنیـاگ: ١. کۆڵـدراو؛ هەڵقەنراو ٢. کەنراوە؛ لە چەسپین ڕزگـارکراو ⚑ ١. حفر شده ٢. برکنده شده

**کەناوەسمە / kenawes(i)me/**: ☜ **کەندەسمە**

**کەنای / kenay/**: چاوگ. کەندن ⚑ کندن

**کەنایا / kenaya/**: نـاو. کەنایـە؛ کـار و ڕەوتی هەڵکەندن (لە کانزا، چێو، بەرد و ...) ⚑ حک

**کەنایش / kenayiş/**: چـاوگ. کەناین: ١. کەنـدن؛ هەڵـکەندن (زەوی) ٢. تاشـین و کۆڵـین (کـانزا، چێو، بەرد و ...) ٣. خوراندن ٤. هاوتایی کردن ⚑ ١. کندن (زمین) ٢. حک ٣. خاراندن ۴. مُقابلە کردن

**کەناین / kenayn/**: ☜ **کەنایش**

**کەنایە / kenaye/**: ☜ **کەنایا**

**کەنتەی / kentey/**: **چاوگ. کەندن ⚑ کندن**

**کەند / kend/**: ناو. کـەنگ: ١. چـاڵ؛ قووڵـکە ٢. ئاودڕ؛ کەندال ٣. گرد؛ تەپۆلکە ٤. شـانی کـەش ٥. دێ؛ ئاوایی ٦. کان؛ کانگا ⚑ ١. چالـە ٢. آبکنـد ٣. تپە ۴. ستیغ کوە ۵. دە؛ آبادی ۶. معدن

**کەندا / kenda/**: ئاوەڵـناو. هەڵکەندراو لـە کـانزا ⚑ حک‌شده روی فلز

**کەندار / kendar/**: ناو. کەندال؛ دادڕاوی زەوی بـە هۆی ئاو یا کەندن ⚑ زمین کنده شده یا آب شسته

**کەندال / kendał/**: نـاو. ١. دادڕاوی زەوی لـە ئـاو یـان لـە ڕووخـان ٢. گـرد؛ تەپۆلـکە ٣. گێـژاو؛ گێژەنگ ⚑ ١. زمین فرو ریختە یا آب شُستە ٢. تپـە ٣. گرداب

**کەنداو / kendaw/**: ناو. ١. ئاودڕ ‹دەشتی مـەریوان پڕ لە کەنداوە/ تەقەی برنەو و نیزامی‌ڕاوە! «فولکلۆر»› ٢. ئاوێ کە لە وشکایی چووبێتە پێش ٣. نۆکەن؛ نۆکەند درگە؛ جۆگەی دەسکرد بۆ ڕۆیشـتنی ئـاو ٤. ئاوەڕا؛ کەندالی دەسـکرد گەیشـتنەیەکی دوو ئاو ⚑ ١. آبکند ٢. خلیج ٣و۴. کانال

**کەندر / kendir/**: ☜ **کەندیل**

**کەندران / kend(i)ran/**: ☜ **کەنران**

**کەندراو** / kend(i)raw/: ☜ **هەڵکەندراو**

**کەندڕ** / kendiř/: ناو. بودڕ؛ قوڵکەی زۆر قووڵ و درێژ لە زەوی ☰ گودال عمیق در زمین

**کەندش** / kendiş/: چاوگ. ١. کەندن ٢. خوروو هاتن ٣. خوراندن ٤. هاوتا کردن ☰ ١. کندن ٢. خاریدن ٣. خاراندن ۴. جفت و جور کردن

**کەندن** / kendin/: چاوگ. تێپەر. //کەندت؛ دەکەنی؛ بکەنە// کەنن؛ کەنین: ١. کۆڵان؛ هەڵکەندن ‹چاڵ کەندن› ٢. جل ژخۆ کردن؛ لیباس دەرهاوردن ‹کۆت و کراس کەندن› ٣. بەردانی با ‹تڕ کەندن› ٤. دەرکێشان؛ هەڵکێشان: *ئا)* گیا لە زەوی ‹کەنگر کەندن› *ب)* موو لە پێست ☰ ١. کندن ٢. لباس درآوردن ٣. باد شکم درکردن ۴. برکندن: *الف)* گیاه *ب)* مو

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەکەندن

**کەندنەوە** / kendinewe/: چاوگ. تێپەر. //کەندتەوە؛ دەکەنییەوە؛ بکەنەوە// هەڵکەندنەوە؛ شتی لکاو لە سەر لابردن ‹چەسپ کەندنەوە› ☰ برکندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەکەندنەوە

**کەندوقۆرت** / kend û qort/: ☜ **کەندولەند**

**کەندوکورت** / kend û kurt/: ☜ **کەندولەند**

**کەندوکۆڵ** / kend û koł/: ناو. کنە؛ کاری کۆڵان ☰ کاوش

**کەندولەند** / kend û lend/: ناو. کەندوکورت؛ کەندوقۆرت؛ شوێنی پڕ لە چاڵ و چۆڵ و بڵندایی و نەویایەتی ☰ زمین دارای پستی و بلندی بسیار

**کەندۆ** / kendo/: ئاوەڵناو. ١. پارین؛ پانێر؛ دوو بەهار دیتوو (گوێلک) ٢. کۆندۆ؛ مانگای ئاوس نەبووی شیردەر ☰ ١. دوبهار دیده (گوساله) ٢. آبستن نشده شیرده (گاو)

**کەندۆخ** / kendox/: ناو. کۆڵەر؛ کەسێ کە چێو، بەرد یان کانزا بۆ نووسین دەکۆڵێ ☰ حکّاک

**کەندوو** / kendû/: ناو. کانەدوو؛ کەنوو؛ کوارِ؛ هەماری جێ دەغڵ و دان ☰ کندوی غله

**کەندوور** / kendûr/: ناو. ئاودڕ؛ کەندڕ ☰ گودال آبکند

**کەندە** / kende/: ناو. ١. خەندەک ٢. چاڵ ☰ ١. خندق ٢. چاه

**کەندەبوو** / kendebû/: ناو. پەپوویک؛ کوند؛ بوو ☰ جُغد

**کەندەسمە** / kendes(i)me/: ناو. کەناوەسمە؛ کەنەسمە؛ ڕەنگاڵە؛ ڕەنگڕەژە؛ ڕەنگڕێژەقاژقاژ؛ مێشخۆرکە؛ مێشخۆرە؛ واوەخۆرە؛ هەنگخۆرە؛ هەنگچنە؛ هەنگەچینە؛ هەنگەخۆرکە؛ هەنگەخۆرە؛ هەنگەژاڵەخۆرە؛ تۆرەمەیەک باڵندەن، بە پۆل دەگەڕێن، باریکەڵەن، باڵیان درێژ و نووکتیژە و کلکیان درێژە، دندووکیان باریک و تا ڕادەیەک خوارە، لە کوناندا هێلانە ساز دەکەن، زۆرتر زەرگەتە و هەنگ دەخۆن، چەن جۆریان هەیە ☰ مُرغ زنبورخوار

**کەندەک** / kendek/: ناو. خەندەق؛ زەویی کۆڵدراوی درێژ و پان ☰ خندق

**کەندەکار** / kendekar/: ناو. کەسێ کە لە دار، بەرد یان کانزا نەخش هەڵدەکەنێ. هەروەها: **کەندەکاری** ☰ کندەکار؛ حکّاک

**کەندەڵان** / kendełan/: ناو. کەنگەڵان؛ لێواری قووڵکەی زۆر فرەوان ☰ کنارەی آبکند گُشاد

**کەندیل** / kendîl/: ناو. کندر؛ کندرە؛ کندێلە؛ کنر؛ کەندر؛ کەنر؛ کەنگەڵان: ١. دەزووی قرقرە ٢. پەتی لە پرزەی گیا ٣. قنگر؛ کەنگر ☰ ١. نخ قرقره ٢. ریسمان الیافی ٣. کنگر

**کەنر** / kenir/: ☜ **کەندیل**

**کەنران** / kenran/: چاوگ. تێنەپەڕ. //کەنرای؛ دەکەنرێی؛ بکەنرێ// کەندران؛ کنیان؛ وە بەر کەندن کەوتن ☰ کنده شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: کەنراو/ چاوگی نەرێنی: نەکەنران

**کەنراو / kenraw/**: ئاوەڵناو. کـەنیاگ؛ کنیـاگ: ١. قووڵ‌کراو (زەوی) ٢. دەرهاتوو (جـل و بـەرگ) ٣. لە سەر لکاو لاکـەوتوو (چەسـپاو) ⬛ ١. کنـدەشـدە (زمین) ٢. کندەشده (لباس) ٣. برکنده (چسبیده)

**کەنراوە / kenrawe/**: ئاوەڵناو. قەڵەو بوو (ئاژەڵ) ⬛ چاق‌وچلّە شده (دام)

**کەنزە / kenze/**: نـاو. ١. جلیسـقەی دەسـچن ٢. ژێرکراس ⬛ ١. جلیقەی دستباف ٢. زیرپیراهن

**کەنسی / kensî/**: ئاوەڵناو. ڕژد؛ ڕەزیـل ⬛ خسـیس؛ کنس

**کەنشت**[١] **/ kenişt/**: ناو. ١. جۆرێ مۆمی هـەنگوین ٢. کەنشتە؛ کەنیسـە؛ پەرسـگای جولەکـە ⬛ ١. نوعی موم عسل ٢. کنیسه

**▪ کەنشت**[٢]: پاشەوشە. ـ کێشان ‹گیان‌کەنشـت› ⬛ ـ کشان

**کەنشـتە / kenişte/**: نـاو. کەنیشـتە؛ کەنشـت؛ پەرسگای جوولەکان ⬛ کنشت؛ معبد یهودیان

**کەنشک / kenişk/**: ☜ **کەنیشك**

**کەنفت / kenift/**: ئاوەڵناو. پـەک‌کەوتـە؛ داکـەوتوو ‹هەر ئەمشەو، ئەو کاتەی گژوگیـا، بەرانبـەر تریفـەی حەپەساو، بە وەنەوز، پێلوویان قورس ئەبێ و کەنفت و ملیان لار ... «شێرکۆ»›. هـەروەها: **کـەنفت بـوون؛ کەنفت کردن** ⬛ ناتوان

▣ **کەنفت بان جێگە**: داکەوتوو؛ نەخۆش و لە جێگە کەوتوو ‹ڕۆڵە! خوا کەنفت بان جێگەت نـەکا› ⬛ بیمار در بستر افتاده

**کەنک / kenik/**: ناو. کرێژی برینی سەر ⬛ شورەی زخم سر

**کەنکەنە**[١] **/ kenkene/**: ناو. چاڵاو؛ چاڵی؛ قومش ⬛ چاه

**کەنکەنە**[٢]: ئاوەڵناو. زۆر زەلام ⬛ بسیار درشت

**کەنکەنـەچی / kenkeneçî/**: نـاو. قومەشـــکەن؛ کەسێ چاڵاو هەڵدەکەنێ ⬛ مُقنی؛ چاەکن

**کەنگ / keng/**: ناو. ١. ☜ **کەند** ٢. چنگی باڵـدار ٣. باڵی باڵدار ⬛ ١. ☜ **کەند** ٢. چنگال پرنـدە ٣. بال پرنده

**کەنگر / kengir/**: ☜ **کەنگەر**

**کەنگرکوڵێن / kengirkułên/**: ناو. کاری نـەختێک کولاندن ⬛ عمل مُختصری جوشاندن

**کەنگرۆشک / keng(i)roşk/**: نـاو. کـەنگرۆک: ١. دانۆکە کـەنگر ٢. بزمـارەی پـا ⬛ ١. کنگردانـه ٢. میخچه

**کەنگرۆک / keng(i)rok/**: ☜ **کەنگرۆشك**

**کەنگـەر / kenger/**: نـاو. قنگـر؛ کنگـر؛ کـەنگر؛ کەرەنگ؛ کەلەنگ؛ کندر؛ کندرە؛ کەنـدیل؛ کنـر؛ کەنر؛ کندێلە؛ قنەر؛ قنگـەر؛ کنگـەری؛ سـتانگ؛ ئەنگینار؛ ئەرتیچۆک؛ بەڵکان؛ **گیایەکی دڕکاوییە، لاسک و گەڵا تەرچکەکانی دەخورێ** ⬛ **کنگر**

**کەنگەلاشـک / kengelaşk/**: نـاو. قانگەلاشـــک؛ دڕووی کەنگر ⬛ بُتەی کنگر

**کەنگەڵان / kengełan/**: ☜ **کەندیل**

**کەنگێ / kengê/**: ئاوەڵکار. کەی؛ چ وەخـت؛ کـام کات ⬛ کی

**کەنن / kenin/**: چاوگ. ١. ☜ **کەندن** ٢. کەنین؛ خـەنین ٣. ڕنـین (وەک: میـوە لـە دار و...) ⬛ ١. ☜ **کەندن** ٢. خندیدن ٣. چیدن (مانند: میوه از درخت و ...)

**کـەنناس / kennas/**: نـاو. سـپوور؛ کـوڵان‌مـاڵ؛ زبیل‌ڕێژ ⬛ رُفتگر

**کـەنۆ / keno/**: نـاو. ١. چێڵـی کۆنـدۆ ٢. پـارین؛ پارینە؛ گوێرەکـەی دووسـاڵان ⬛ ١. گـاو آبسـتن نشدەی شیردە ٢. گوسالەی پارینە

**کـەنۆک / kenok/**: ئاوەڵـناو. دەم‌بـەپێکـەنین ⬛ خندەرو

**کەنـوو / kenû/**: نـاو. ١. ☜ **کـەنـدوو** ٢. پلـوورە؛ خەلێف ٣. کـەن؛ خەنـدە ⬛ ١. ☜ **کـەنـدوو** ٢.

کندوی زنبور عسل ٣. خندە

◘ **کەفتە کەل کەنو:** *[کنایە]* ١. لە کار کەوتن و کەڵک نەمان ‹سەماوەرەکەمان کەفتە کەل کەنووا› ٢. دەورانی (شتێ) تێپەڕ بوون ‹سەماوەر نەفتی کەفتە کەل کەنووا› ☰ ١. از کار افتادن ٢. دورانی (چیزی) گذشتن

**ـ کەنە / -kene/:** پاشوشە. کەندن یان کەنراوە ‹دەس‌کەنە› ☰ ـ چین

**کەنەجمە / kenecime/:** ناو. ڕەوت یان دۆخی جمینی کەن و لە جێ ترازانی هەندێ لە خاک و بەردەکەی. هەروەها: **کەنەجمە کردن** ☰ رانش زمین

**کەنەسمە / kenes(i)me/:** ☜ **کەندەسمە**

**کەنەف / kenef/:** ناو. ١. ئاودەس؛ کناراو؛ پێشاو ٢. دەزوو؛ دەزگ ٣. گیاکندر؛ وژەگیا ☰ ١. مُستراح ٢. ریسمان ٣. کنف

**کەنەفت / keneft/:** ئاوەڵناو. زایف؛ لاواز؛ کز؛ لەڕ ☰ ضعیف

**کەنەک / kenek/:** ناو. ١. تەلەسەنگ؛ بەردی زل ٢. کەندەک؛ خەندەک ‹چون سەراسەر جەوهەری، نەک جەوهەری هەر ئاگری/ کێ ئەڵێ دەشت و دەر و کێو و کەنەک داناگری؟ «قانع»› ٣. ئاودڕ؛ کەنداڵ ☰ ١. سنگ بزرگ ٢. خندق ٣. آبکند

**کەنەنە / kenene/:** ناو. موغاری کەوچک کۆڵین ☰ مُغار کندن قاشق چوبی

**کەنەوە / kenewe/:** ناو. کاری هەڵکەندن ☰ عمل کندن

**کەنهەش / kenheş/:** ئاوەڵناو. سەربزێو؛ شەقی ☰ سرکش؛ یاغی

**کەنی / kenî/:** ناو. کەنیشک؛ دۆت؛ کچ ☰ دختر

**کەنیاگ / kenyag/:** ☜ **کەنراو**

**کەنیان / kenyan/:** چاوگ. ١. هەڵدرانەوە؛ هەڵدریانەوە (زەوی) ٢. داکەنران؛ داکنیان (جل و بەرگ) ٣. هەڵپاچران؛ هەڵکنیان (موو، خوری و ...) ٤. هەڵکێشران؛ هەڵکێشیان (گیا و ...) ☰ ١. کندەشدن (زمین) ٢. کندەشدن (لباس) ٣. برکندەشدن (مو، پشم و ...) ۴. بیرون کشیدە شدن (گیاە و ...)

**کەنیز / kenîz/:** ناو. کەنیزەک: ١. قەرەواش؛ کلفەت ٢. ژنی بە پارە کڕدراو ☰ ١. کُلفَت خانە ٢. کنیز زرخرید

**کەنیزەک / kenîzek/:** ☜ **کەنیز**

**کەنیسە / kenîse/:** ☜ **کڵێسە**

**کەنیشت / kenîşt/:** ناو. ١. ڕیپۆقی چاو ٢. کەمێڵە ☰ ١. ژفک؛ قی چشم ٢. آن‌دماغ

**کەنیشتە / kenîşte/:** ☜ **کەنشتە**

**کەنیشک / kenîşk/:** ناو. کەنشک؛ کچ؛ کناچە؛ دۆت؛ قز؛ قیز ☰ دختر

**کەنیشکانە / kenîşkane/:** ☜ **کچانە**

**کەنیشکەزا / kenîşkeza/:** ☜ **کچەزا**

**کەنیشکی / kenîşkî/:** ناو. ١. ☜ **کچێتی** ٢. کچی؛ دۆتی؛ سەردەمی پێش شوو کردن ٣. ڕەشێنەی چاو ☰ ١. ☜ **کچێتی** ٢. دوران قبل از ازدواج ٣. مردمک چشم

**کەنیک / kenîk/:** ناو. کچی شوونەکردوو ☰ دوشیزە

**کەنیگری / keng(i)rî/:** ناو. فرمێسکی شادی ☰ اشک شوق

**کەنیلە / kenîle/:** ناو. کچی چکۆلە ☰ دخترک

**کەنین / kenîn/:** چاوگ. تێنەپەڕ. //کەنیت؛ دەکەنی؛ بکەنە// ١. ☜ **کەندن** ٢. خەنین؛ پێکەنین ☰ ١. ☜ **کەندن** ٢. خندیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: کەنیو/ چاوگی نەرێنی: نەکەنین

**کەنیندار / kenîndar/:** ☜ **پێکەنیندار**

**کەنێر / kenêr/:** ☜ **کەنێرە**

**کەنێرە / kenêre/:** ناو. کنێر؛ کنێرۆک؛ کەنێر: ١. کنێرە؛ ناوی دوو جۆرە دارە، یەکی بە دڕک و یەکی بێ دڕک ٢. کنێرە؛ گیایەکە گوڵی جوانی

هەیە ٣. قوونێر؛ کوانێکە لە سمت دێت ⚑ ١. نام دو درخت خاردار و بی خار ٢. گیاهی است با گل‌های زیبا ٣. دُمل ناحیه‌ی نشمینگاه

**کەنێش / kenêş/**: ناو. بەلا؛ دەرد؛ ئازار ⚑ درد؛ آسیب

**کەو / kew/**: ناو. ١. کاو؛ کۆوک؛ کەومک؛ کەپک؛ کەڤ؛ کەکلێ؛ کەوک؛ کووک؛ کەبک؛ کەوگوێزەل؛ زارا؛ زارانز؛ زارانج؛ زەرەج؛ زەڕەج؛ زەرەچ؛ زارتەر؛ ژرەژ؛ ژەرەژ؛ ژەرەژی؛ دودرگ؛ دورگ؛ خاسەکەو؛ باڵندەیەکە لە تۆرەمەی قەرقاوڵ، بە جەستەیەکی خڕی هێندێک لە کۆتر زلتر، پا و دەندووکی سوور و خوار و ئەستوورە، بۆ دەنگی و گۆشتەکەی ڕاوی دەکەن ٢. سەرەند؛ سەرەد؛ کارماخ؛ پەڕەیەکی تۆڕی درشت‌چن، بۆ جیاکردنەوەی درشت لە ورد ٣. کاری کوشینی کوان و برین ٤. داغ؛ چزە بە ئاسنی سووروەوەبوو ٥. کەف؛ کۆمایەک لە تۆقلەی وردیلەی گاز لە تراوێکدا ⚑ ١. کبک ٢. سرند ٣. عمل فشردن دُمل ۴. داغ‌گذاری ۵. کف

⊡ **کەو کردن:** ☜ **لە کەو دان**

**کەو لێدان:** ☜ **لە کەو دان**

**بە کەودا تەقاندن:** ☜ **لە کەو دان**

**لە کەو دان:** کەو کردن؛ کەو لێدان؛ بە کەودا تەقاندن؛ بە سەرەند دابێژتن ⚑ با سرند بیختن

**کەوناسا / kew'asa/**: ئاوەڵناو. [کینایە] کەڤین؛ خاڵ‌لەڕوو ⚑ صورت خالدار زیبا

**کەوا / kewa/**: ناو. کەوێ: ١. باڵاپۆشی ئاودامانی پیاوانە ٢. باڵاپۆشی تا بەر پشتێند ٣. کولەجەی لۆکە تێ‌خراو ٤. کەڵە شاخی خوێن بەردان ⚑ ١. قبا ٢. نیم‌تنه ٣. یلک آستین‌دار ۴. شاخ حجامت

**کەوابوو / kewabû/**: ئاوەڵکار. کەواتا؛ کەوایە؛ کەوابێ؛ ئەوجا؛ ئینجار ⚑ بنابراین

**کەوابێ / kewabê/**: ☜ **کەوابوو**

**کەوات / kewat/**: ☜ **کەبات**

**کەواتا / kewata/**: ☜ **کەوابوو**

**کەواتر / kewatir/**: ☜ **کۆتر**[1]

**کەواتری / kewat(i)rî/**: ☜ **کۆتر**[1]

**کەواتە / ke wate/**: ئامراز. هەرگا وایە؛ جا ئەگەر وایە ⚑ در این صورت؛ بنابراین

**کەواچور / kewaçur/**: ناو. کەواچیر؛ زڕەکەو ⚑ کبک چیل

**کەواچوو / kewaçû/**: ناو. زڕەکەو؛ زەڕەکەو ⚑ کبک چیل

**کەواچیر / kewaçîr/**: ☜ **کەواچور**

**کەواخە / kewaxe/**: ناو. قاپۆڕ؛ قاپێلک؛ توێکڵ ⚑ قشر؛ پوسته

**کەوار / kewar/**: ناو. کەڤار: ١. کەندووی ئارد و دانەوێڵە ٢. کەوارە؛ کەڤار؛ سەوەتە ⚑ ١. کندوی غله ٢. سبد

**کەوارە / keware/**: ☜ **کەوار-٢**

**کەواری / kewarî/**: ناو. کەواڕ؛ کەوبار؛ بارەکەو؛ کەوەبار ⚑ جوجه‌کبک

**کەواڕ / kewař/**: ☜ **کەواری**

**کەواز / kewaz/**: ناو. عاسا؛ داردەست ⚑ عصا

**کەواشە / kewaşe/**: ناو. ١. ئالاش؛ چرپی و پووش بۆ بن قوڕەبان ٢. [کینایی] هەر شتی بێ‌قیمەت ⚑ ١. انبیره ٢. آت‌وآشغال

**کەوال / kewal/**: ناو. ١. کەڤال؛ پاژێکی بچووک لە مێگەل ٢. مالات؛ دەوڵەت ٣. کاژی مار ٤. قەباڵە؛ قەواڵە ⚑ ١. بخشی کوچک از گله ٢. دام اهلی ٣. پوسته‌ی مار ۴. سند مالکیت

**کەوان / kewan/**: ناو. کەڤان: ١. کەمان؛ دارێکی نیوەجەغزە ژێی تێ دەخرێ بۆ تیر پێ هاویشتن ٢. ئامرازی خوری و لۆکە شی کردنەوە ⚑ ١. کمان تیراندازی ٢. کمان پنبه‌زنی

⊡ **کەوان کشاندن:** ☜ **کەوان کێشان**

**کەوان کێشان**: کەوان کشاندن؛ ژێ کەوان بە تیرەوە کێشان بۆ هاویشتنی تیر ☚ کمان کشیدن

**کەوان/ کەوانە دان**: خەڵف و تەرزی دار لارەوە کردن و کردنە ژێر خاکەوە کە ڕەگ داکوتێ و دواتر ببێتە دارێکی سەربەخۆ ☚ خوابانیدن شاخەی درخت تا درخت تازەای شود

**کەوان‌پیتک** / kewanpîtik/: ناو. قەڵماسک؛ قۆچەقانی؛ بەرەقانی ☚ فلاخن

**کەواندن** / kewandin/: چاوگ. کەڤاندن؛ کۆتنای؛ کۆتینای: ۱. داخستن ۲. داخ کردن ☚ ۱. انداختن ۲. داغ گذاردن

**کەوانو** / kewanû/: ☜ **کابان**

**کەوانە** / kewane/: ناو. ۱. ☜ **کەمە** ۲. لاکان؛ تەنراوێکە لە تووڵ، دەبەسرێتە ژێر کەوشەوە بۆ بە سەر بەفردا ڕۆیشتن ۳. دوو خەتۆکەی کەوانی کە وشەی دە نێودا دەنووسن ٤. لای داوێنی مێگەل لە سەر هەوێز ☚ ۱. ☜ **کەمە** ۲. صفحەی ترکەای زیر کفش ویژەی راەرفتن روی برف ۳. پرانتز ۴. دُنبالەی گلە

▣ **کەوانە کردن**: ۱. لە شتێک دان و گەڕانەوە ۲. دە هاویشتندا چەمانەوە ☚ ۱و۲. کمانە کردن

**کەوانەدار** / kewanedar/: ☜ **کەوانەیی**

**کەوانەیی** / kewaneyî/: ناوەڵناو. کەوانەدار؛ چەماو وەک کەوان ☚ قوسدار

**کەوانی** / kewanî/: ناوەڵناو. چەماو وەک کەوان ☚ کمانی

**کەواو** / kewaw/: ☜ **کەباب**

**کەواوچی** / kewawçî/: ☜ **کەبابچی**

**کەواوکەر** / kewawker/: ☜ **کەبابچی**

**کەواوی** / kewawî/: ☜ **کەبابچی**

**کەوایە** / kewaye/: ☜ **کەوابوو**

**کەوبار** / kewbař/: ☜ **کەواری**

**کەوباز** / kewbaz/: ناو. ۱. کەسێ کە ڕاوەکەو دەکا ۲. کەسێ کە کەو ڕادەگرێ ☚ ۱. شکارچی کبک ۲. نگهدارندەی کبک شکاری

**کەوبازی** / kewbazî/: ناو. کار و ڕەوتی خوو بە کەو گرتن و کایە کردن لەگەڵیان ☚ کبک‌بازی

**کەوبوار** / kewb(i)war/: ☜ **کەوپەڕ**

**کەوبوێر** / kewb(i)wêr/: ☜ **کەوپەڕ**

**کەوبەدار** / kewbedar/: ناو. هەڕەتی برانەوەی بەهار کە کەو لە دار دەنیشن ☚ اواخر بهار

**کەوبەزێن** / kewbezên/: ناو. کەوی شەڕانی کە لە شەڕدا ئازایە و کەوانی دی دەبەزێنێ ☚ کبک جنگی

**کەوپەڕ** / kewpeř/: ناو. کەوبوار؛ کەوبوێر؛ ڕێگەی گەرمێن-کوێستان کردنی کەو ☚ مسیر ییلاق و قشلاق کبک‌ها

**کەوپێچ** / kewpêç/: ناو. تیمان؛ ئەو شوێنەی پۆلی کەوی پێدا دەڕۆن و ڕاوچییان ڕاویان دەکەن ☚ محل عبور دستەهای کبک

**کەوت**[1] / kewt/: ناو. ۱. ☜ **کەیکف** ۲. کەرکەمەڕ؛ کۆی چەند مەڕێک ☚ ۱. ☜ **کەیکف** ۲. تعدادی گوسفند

**ـ کەوت**[2]: پاشەوشە. ـ کەفت: ۱. دابین بوون؛ پێکهاتن ‹دەسکەوت؛ ڕێکەوت› ۲. خەر؛ خراو ‹پاشەکەوت› ☚ ۱. ـ یابی؛ ـ یافت ۲. ـ انداز

**کەوتا** / kewta/: ناوەڵناو. کەوتە؛ تەڕوتلیس ☚ خیس

**کەوتان** / kewtan/: چاوگ. ۱. کەتن؛ کەوتن؛ کەفتن ۲. ڕازان؛ ڕاکشان ☚ ۱. افتادن ۲. دراز کشیدن

**کەوتاندن** / kewtandin/: چاوگ. ۱. وەڕینی سەگ ۲. تۆپاندن؛ مراندنی حەیوانێ کە گۆشتی ناخورێ ۳. دان بە زەویدا ☚ ۱. عوعو کردن سگ ۲. کشتن حیوان حرام‌گوشت ۳. بر زمین انداختن

**کەوتش / kewtiş/:** ☜ **کەوتن**

**کـەوتن / kewtin/:** چـاوگ. تێنەپـەڕ. //کـــەوتی؛ دەکـەوی؛ بکـەوە// کـەفتن؛ کـەتن؛ کەوتـەی؛ کەوتش: ١. هەڵدێران؛ بەر بوونەوە بـەرەو خـوار ٢. نـزم بوونـەوە؛ نیشـتن؛ دابـەزین ٣. [مەجاز] بێحورمەت بوون؛ ڕێز نەمان ٤. [مەجاز] تێشـکان؛ نابووت بوون؛ لێقەومان ٥. ڕاکشان و هەڵنەستان (لەبـەر نەخۆشـی) ٦. داکـەوتن؛ ئـۆقرە گـرتن ٧. بەرکەوتن؛ لێکەوتن ٨. بەرکەوتن؛ پێبڕان ☰ ١. افتـادن ٢. پیـاده شـدن ٣. خـوار و خفیـف شـدن ۴. ورشکست شدن ۵. بسـتری شـدن ۶ آرام گـرفتن ۷. اصابت کردن ۸ عاید شدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: کـەوتوو/ چـاوگی نـەرێنی: نەکەوتن

**تێبینی:** «کەوتن» لە سـەرەتای گـەلێک چـاوگی لێکـدراودا بەشـداری دەکـا و واتایـەکی تایبـەت دروست دەبێ:

| | |
|---|---|
| کەوتنە بان | کەوتنە بەر |
| کەوتنە پەلەقاژە | کەوتنە پیسی |
| کەوتنە جرتوفرت | کەوتنە جنێودان |
| کەوتنە حەلوەلا | کەوتنە خوار |
| کەوتنە خواردن | کەوتنە درۆ دان |
| کەوتنە دەس | کەوتن ڕێ |
| کەوتنە ژێر | کەوتنە سوێند خواردن |
| کەوتنە سەر | کەوتنە سەر دەس‌وپا |
| کەوتنە شوێن | کەوتنە قور پێوان |
| کەوتنە کار | کەوتنە کلکەلەقێ |
| کەوتنە کێشەوە | کەوتنە گریان(ەوە) |
| کەوتنە گوو خواردن | کەوتنە لاوە |
| کەوتنە هاوار کردن | .... |

**کەوتنـەوە / kewt(i)newe/:** چـاوگ. کەفتنـــەوە؛ کەوتەیوە؛ کەوتەیۆ: ١. دیسان کەوتن ٢. مانـەوە لـە هـەوالان لـە سـەفەردا ٣. دوای چابوونـەوە دیسـان نـەخۆش کـەوتن ☰ ١. دوبـاره افتـادن ٢. جاماندن در سفر ٣. عود کردن بیماری

**کەوتوخێز / kewt û xêz/:** نـاو. ڕوەتی هەڵسـان و کەوتن ‹دێوجامە گوڵ ـ گوڵ پارێز بە پاڕێز/ گا چـاو لە جەیران گا لە کەوت‌وخێز «قانع»› ☰ اُفت‌وخیز

**کەوتوڕەوت / kewt û řewt/:** ☜ **کەفت‌وڕەفت**

**کەوتـوو[1] / kewtû/:** ئاوەڵـناو. کـەتی؛ کـەفتگ؛ کەفتوو؛ کەفتە؛ کەفتی؛ بەرەوبوو ☰ افتاده

**ـ کەوتـوو[2]:** پاشەوشـە. ـــ کەوتـە؛ لـە دۆخ یـان چۆنیەتییەکدا ‹سەرکەوتوو؛ دواکەوتوو؛ دەرکەوتوو› ☰ ـ افتاده

**کەوتوویی / kewtûyî/:** نـاو. کەفتـەیی؛ سـوورەیاو؛ گرانـەتا؛ گرانـەتێ؛ ڕەش‌گـرانی؛ ڕەشـەگرانەتا؛ ڕەشەگرانەتی؛ ئێشاگران؛ نەخۆشینێکی تووشە لە گیانـدارێکی زۆر ورد کـە بـە ئەسـپێەوە دێ و دەگوێزرێتـەوە و تـەوی گـران، شـل و شـەوێقی لەش و وڕاوەی جاروبارەشی لەگەڵایـە و پێسـتی نەخۆش جوانەزرۆی سووری ئاماڵ ڕەش دەردەدا ☰ تیفوس

**کەوتە[1] / kewte/:** ناو. دەستە؛ قۆڵە ☰ دسته

**کەوتە[2]:** ☜ **کەوتا**

**ـ کەوتە[3]:** پاشەوشە. ـکەوتوو ‹لاکەوتە› ☰ ـ افتاده

**کەوتەر / kewter/:** ☜ **کۆتر[1]**

**کەوتەرەی / kewterey/:** ☜ **داکەوتن**

**کەوتەی / kewtey/:** ☜ **کەوتن**

**کەوتەیرە / kewteyre/:** ☜ **داکەوتن**

**کەوتەیوە / kewteywe/:** ☜ **کەوتنەوە**

**کەوتەیۆ / kewteyo/:** ☜ **کەوتنەوە**

**کەوتی / kewtî/:** ئاوەڵـناو. تۆپیو؛ تۆپیگ ☰ لاشەی نجس

**کەوتین / kewtîn/:** چاوگ. تۆپین ☰ سَقَط شدن

**کەوتێر / kewtêr/:** ☜ **کەمتار**

**کەوجز / kewciz/:** ناو. کـەجێز: ١. ئاوگـەردان ٢.

ئەسکوێ ☰ ١. آبگردان ٢. ملاقه

**کـەوجـورەت** / kewcuret/: ئاوەڵـناو. ترسـنۆک؛ ترسۆک ☰ ترسو

**کەوجێز** / kewcêz/: ☜ **کەوچێز**

**کەوچ**[1] / kewç/: نـاو. ١. دەفـر و ئـامرازی قوولـی خـوار و خـێچ و نارێـک ٢. پێوانـە ☰ ١. ظـرف دهن‌کج ٢. پیمانه

**کەوچ**[2]: ئاوەڵناو. زارخوار؛ دەم‌لار ☰ دهن‌کج

**کەوچڕ** / kewçiř/: ناو. ڕەزبەر ☰ مهرماه

**کـەوچک** / kewçik/: نـاو. کـاچ؛ کاچـک؛ کۆچـک؛ کۆچکـە؛ کـەچک؛ کـەچی؛ کـەفچک؛ کـەفچی؛ کەڤـچ؛ کەڤـچی؛ کەڤـک؛ کـەمچک؛ کەمچـە؛ کەوچـە؛ قـاچوق؛ قاشـوخ: ١. ئامرازێـک بـە دەمەیەکی گردی قوپاو و دەسکێکی درێژەوە، بۆ هەڵـگرتن، تێکـەڵ کـردن و خـواردنی چێشـت ‹هـەرچێ لـە کاسـە بـێ، بـە کـەوچک تێتـە دەر «مەسەل»› ٢. ئەو شتەی لـە نێویدایـە ‹تـۆ فریـا نەکەوتی/ کەوچکێ دەرمان بەی بە گۆران «شێرکۆ»› ☰ ١و٢. قاشُق

**کەوچکبەدەسـت** / kewçikbedest/: نـاو. [کینایـە] کەیخودا؛ کاربەدەست ☰ کاربەدست

**کەوچکە** / kewç(i)ke/: ناو. ١. گەرووڵـەی ئـاش؛ پلووسکی گەنم لە ئاسیاودا ٢. حەوزۆکەی تارەت گرتن لە ئاودەسـتی یەکسـەری مزگـەوتان ☰ ١. ناودان گندم در آسیا ٢. حوضچه‌ی سراسری طهارت در مُستراح مساجد قدیم

**کەوچکەقوڵە** / kewçkequłe/: ☜ **کەچکەقوڵە**

**کەوچکەماسـی** / kewç(i)kemasî/: نـاو. جۆرێـک ماسییە دەمی وەک کەوچک وایە ☰ بیل‌ماهی

**کەوچولـەوچ**[1] / kewç û lewç/: ناو. کەوچەکـەوچ؛ شێوەی قسـە کـردنی مـرۆی دەمخـوار ☰ حالـت سخن گفتن آدم دهن‌کج

**کەوچولـەوچ**[2]: ئاوەڵـناو. کەوچەکـەوچ؛ دەمخـوار ☰ دهان‌کج

**کەوچە**[1] / kewçe/: ☜ **کەوچك**

**کەوچە**[2]: ئاوەڵناو. دەمخوار ☰ کج‌دهان

**کەوچەرین** / kewçerîn/: ناو. ڕەزبەر؛ یەکەم مانگی پاییز ☰ مهرماه

**کەوچەکەوچ** / kewçekewç/: ☜ **کەوچ و لەوچ**

**کەوچێز** / kewçêz/: نـاو. کشتێل؛ کوندەز؛ کەپچە؛ کەشتیلە؛ کەوندێز؛ کـەوجێز؛ کـەوجز؛ کەمچـە؛ کەمچگ؛ کەشتێلە؛ کەڵخە؛ کەڵۆخە؛ قەلووخـە؛ قوڵـەغە؛ قـەلووخ؛ قولۆخـە؛ مـەلاک؛ ئەسـکوێ؛ ئەسکۆ؛ ئەسکوو؛ وسکی؛ هەسکە؛ هسکۆ؛ هەسکۆ؛ هەسکوێ؛ خەرشەب؛ چەمچک؛ چەمچە؛ چمچە؛ کاسۆڵەی دەسک‌درێژ بۆ تراو گۆزتنەوە ☰ ملاقه

**کەودانک** / kewdanik/: نـاو. جێگەی قاپ‌وقاچـاغ؛ شوێنی دەفروئامان ☰ جای ظروف

**کەودەر** / kewder/: ☜ **کەودەری**

**کـەودەری** / kewderî/: نـاو. کـەودەر؛ کـەوەدەری؛ باڵدارێکی جنجیره به قەد مریشکێ دەبێ، سـەری بۆرە و زۆربەی لەش و باڵی سپییە، جووت‌ـجووت دەگەڕێن و لە نزیـک بـەفران دەژیـن ‹هەوایـەکم هەڵدەمژێ/ کورد و کەودەری پێ دەژی «هێمن»› ☰ کبک دری

**کەودەن** / kewden/: ئاوەڵـناو. زەین‌کوێر؛ دەبـەنگ؛ نازیرەک ☰ کودن

**کـەور** / kewr/: نـاو. ١. بـزنی سـپی ٢. کەڤـر؛ کوچک؛ بەرد؛ سەنگ ☰ ١. بُز سفید رنگ ٢. سنگ

**کەورک** / kewirk/: ناو. جـۆرێ هـەرمێ ☰ نـوعی گلابی

**کەورگ** / kewirg/: ناو. ئەشکەوت؛ شکەفت ☰ غار

**کەورنگان** / kewringan/: ناو. ئاوێتەی گەنم لە جۆ یان لە هەرزن ☰ گندم آمیخته با جو یا ارزن

**کەورەوان** / kewrewan/: نـاو. ڕازەوان؛ شـاخەوان؛ تاشەوان ☰ صخره‌نورد

**کەوری / kewrî/**: ناو. کـوار؛ عـەماری دەغـڵ و دانەوێڵە 🇮🇷 انبار غلّە

**کەوریشک / kewrîşk/**: ☜ **کەروێشك**

**کەوریە / kewr(i)ye/**: ☜ **کەروێشك**

**کەورێشک / kewrêşk/**: ☜ **کەروێشك**

**کەورێشکە / kewrêşke/**: ☜ **کەروێشکە**

**کەوڕ / kewiř/**: ناو. پێست؛ پێس 🇮🇷 پوست

**کەوڕاو / kewřaw/**: ناو. ڕاوەکـەو؛ ڕاوی کـەو 🇮🇷 شکار کبک

**کەوڕخ / kewiřx/**: ئاوەڵناو. ترسـنۆک؛ ترسـۆک 🇮🇷 ترسو

**کەوزوویەڵە / kewzûyele/**: ئاوەڵناو. ترسـنۆک؛ ترسۆک 🇮🇷 ترسو

**کەوزەن / kewzen/**: ☜ **کەوزەنەك**

**کەوزەنەک / kewzenek/**: ناو. کـەوزەن؛ واشـە؛ باڵدارێکی ڕاوچییە 🇮🇷 قرقی

**کەوزێلگ / kewzêlig/**: ئاوەڵناو. ترسـنۆک؛ کەلەزات 🇮🇷 ترسو

**کەوژ / kewij/**: ناو. ١. بێزوو؛ کەرب ٢. هێشـووی تـرێ کـە بـە دارەوە وشـک دەبـێ 🇮🇷 ١. ویـار ٢. خوشەی انگور بر درخت خشکیده

**کەوژاندن / kewjandin/**: چاوگ. کەوشـاندن: ١. فڕێ دان ٢. گێژ کردن 🇮🇷 ١. دورانـداختن ٢. گـیج کردن

**کەوژین / kewjîn/**: چاوگ. ١. بێـزوو کـردن ٢. وشک بوون (وەک: هێشووی ترێ بـە دارەوە) 🇮🇷 ١. ویار کردن ٢. خُشکیدن (مانند: خوشەی انگور بر درخت)

**کەوسەر / kewser/**: ناو. کانیاوێکە لە بەهەشـت 🇮🇷 کوثر؛ چشمەی بهشتی

**کەوسەڵ / kewseł/**: ☜ **کیسەڵ**

**کەوش / kewş/**: ناو. ١. کەفش؛ پێڵاو؛ پێلاڤ؛ پێڵا؛ پاڵا؛ پاڵاو؛ پێتـاو؛ پێڵـە (ژنانـە)؛ شـەکاڵ؛ سـۆڵ؛ سۆڵک؛ تسەک؛ چەمیش؛ تایاخ؛ مووزک؛ چارۆخ؛ پۆشەنی دەرەوەی قاچی مرۆڤ، زۆرتر لە چـەرم یان ماکێکی نەرم، بە ژێرە و سـەرەوە ٢. کـەش؛ بن هەنگەڵ ٣. چۆنیەتی دڵ بوورانەوە ٤. سەحرا؛ دەشـت و مـەزرا «گۆوەنـد لـە کەوشـە دوور لـە وشکەسۆفین/ دەرفەتە مـەم گوشـین و هەلگلـۆفین «هەژار، *بۆ کوردستان*»» 🇮🇷 ١. کفش ٢. زیـر بغـل ٣. غش؛ چگونگی از حال رفتن ٤. صحرا

**کەوشاندن / kewşandin/**: ☜ **کەوژاندن**

**کەوشدروو / kewşd(i)rû/**: نـاو. کەوشـدۆز؛ کەوشـدوور؛ کەوشـگەر؛ پـاڵاوراز؛ پـێڵاودروو؛ پێڵاودوور؛ سۆڵکەر؛ سۆڵدروو؛ پینەچی 🇮🇷 کفّاش

**کەوشدۆز / kewşdoz/**: ☜ **کەوشدروو**

**کەوشدوور / kewşdûr/**: ☜ **کەوشدروو**

**کەوشکەن / kewşken/**: ناو. پێشـخانە؛ ماڵماشـت؛ پاکەن؛ پاکەنە؛ پاڵاوەژ؛ پاڵاوەش؛ جێگەی کەوش داکەندن لە پەنای دەرگاوە 🇮🇷 کفشکن

**کەوشگەر / kewşger/**: ☜ **کەوشدروو**

**کەوشن / kewşin/**: ☜ **کەوشەن**

**کەوشەک / kewşek/**: ناو. ١. ☜ **کـەوشـێن** ٢. کاری کردنە ژێر خاکـەوەی لقـی دار. هـەروەها: **کەوشەک (لێ) دان** 🇮🇷 ١. ☜ **کـەوشـێن** ٢. عمـل خواباندن شاخەی درخت

**کەوشەمە / kewşeme/**: ناو. خووسار؛ خازێ؛ زوقـم 🇮🇷 یَخ؛ سرماریزە

**کەوشەن / kewşen/**: ناو. کەوشن؛ سـنوور؛ مـەرز؛ سەرحەد 🇮🇷 مرز

**کەوشین / kewşîn/**: چاوگ. بوورانـەوە؛ لەسـەرخۆ چوون 🇮🇷 غش کردن

**کەوشێن / kewşên/**: ناو. کەوشـەک؛ یاریـەکی چەندکەسییە بە ڕیز دەنووشتێنەوە و یەکەیەکـە، بە نۆرە لە سەر پشـتی یـەکترەوە بـاز دەدەن 🇮🇷 بازی پرش نوبتی بر پشت هم

**کەوقژک / kewq(i)jik/**: ناو. قاژوو 🇮🇷 کلاغ سیاه

**کەوک** / kewik/: ناو. ١. ☜ **کەو-١** ٢. ☜ **کەوە-٢**

**کەوکز** / kewkiz/: ناو. سولتان؛ شا ☰ سُلطان

**کەوکورد** / kewkurd/: ☜ **کۆکرد -١**

**کەوکەڤۆک** / kewkevok/: نـاو. پشـــیلەپاییزە؛ شەلەمینکەرە؛ بەری گیایەکە ☰ قاصدک

**کەوکەل** / kewkel/: نـاو. کوکـــەل؛ پـــەپوو؛ پەپووسلێمانە ☰ هُدهُد

**کەوکەمانە** / kewkemane/: ناو. کوانی مەلاشـوو؛ دومەڵێکە لە لای سەرووی ناو دەمـەوە دێـت ☰ دُمل سقف دهان

**کەوکەندەر** / kewkender/: ناو. باڵدارێکە لـە کـەو دەکا، بەڵام زلترە ☰ پرندەای شبیه کبک اما بزرگتر

**کەوکەو** / kewkew/: ناو. گولەئەستەمبولی؛ گـولا شێستپەڕ؛ گولە ئەستەمبولی؛ گولێکی پڕ پەلکە بە زۆر ڕەنگان ☰ گُل کوکب

**کەوکەوەڕاو** / kewkeweřaw/: نـاو. *[کنایە]* ڕەوتی گـــەڕان و ملـــەقوتێ و ڕابـــواردن ☰ گـــردش و چشمچرانی

**کەوکی** / kewkî/: نـاو. ســەوزەگیـای هــەراش ☰ سبزەی شاداب و بُلند

**کەوگ** / kewig/: ☜ **کەوە -٢**

**کەوگری** / kewg(i)rî/: ناو. شـیوەن؛ گریـانی بـە دەنگی بەرز ☰ شیون

**کەوگوێزەل** / kewg(i)wêzel/: ☜ **کەو-١**

**کەوگی** / kew(i)gî/: نـاو. کـەوەگی؛ مـێ؛ مچـی؛ مـووچ؛ گەنـە؛ گـاوەک؛ کـەوەی؛ کەرجـە؛ نـۆژ؛ کەرزک؛ کەرژە؛ تـەنبوو؛ تـەبۆ؛ پیتـک؛ چنگنـە؛ گەنەکەولە؛ مێروویەکی چکۆلەیە دەم لە پێسـتی گیانەوەران دەنێ و خوێنیان دەمژێ ☰ کنە

**کەوگیر** / kewgîr/: ناو. کەفگیر؛ کەفتیر؛ کەڤـگیر؛ کـەویر؛ مەفسـک؛ مفسـک؛ هسـکیف؛ مووخـل؛ ئەستێڤـک؛ کـەوگیر؛ قـەواش؛ کەرەسـتەیەکی دەمپانە ناوەکەی تۆزێ قووڵـە، بـە دەسـتەیەکی درێژەوە، بنی چێشت یان خواردەمەنی بـێ‌ئـاوی پێ هەڵدەگرن ☰ کفگیر

**کـەوگیرە** / kewgîre/: نـاو. جـــۆرێ کـــوان ☰ کفگیرک؛ نوعی دُمل

**کەوگێز** / kewgêz/: ناو. چەمچ؛ کەوچکی دەمپانی بەننایی ☰ چمچەی بنّایی

**کەولی** / kewlî/: ☜ **کاوڵی**

**کەوڵ** / kewł/: ناو. ١. کەڤـل؛ کەڤـەل؛ پێسـتەی مەڕ و بزن و هەر حەیوانێکی تر ٢. سفرەی چەرم ٣. کەڵپۆس؛ کورک؛ پۆسین ☰ ١. پوست حیوانات ٢. سُفرەی چرمی ٣. پوستین

⊡ **کەوڵ کردن**: پێست لە بـەر داماڵـین ☰ پوسـت کندن

**کـەوڵپۆس** / kewłpos/: نـاو. کەڵـپۆس؛ پۆسـین؛ کورک ☰ پوستین

**کەوڵـدروو** / kewłd(i)rû/: نـاو. کەوڵـــکەر: ١. پۆســـیندروو ٢. کەســـێ ســـفرەی چـــەرمین ئەدوورێ ☰ ١. پوستین‌دوز ٢. سُفرەی چرمی‌دوز

**کەوڵکەر** / kewłker/: ناو. ١. ☜ **کـەوڵـدروو** ٢. کەسـێ پێسـت لـە مـاڵات دادەڕنـێ ☰ ١. ☜ **کەوڵدروو** ٢. پوست‌کن

**کەوڵۆس** / kewłos/: ناو. ١. ☜ **کلۆس** ٢. ئـاودڕ؛ ڕەندۆڵ؛ کەندال ☰ ١. ☜ **کلۆس** ٢. آبکند

**کەوڵـە** / kewłe/: نـاو. ١. ☜ **کـەوە** ٢. جـۆرێ کەوگی ورد ٣. ڕیخەڵان؛ جێگەی ڕەڵمی زۆر ٤. گیا وردیلەی بەهاران کە زۆر زوو زەرد دەبـێ ☰ ١. ☜ **کەوە** ٢. نـوعی کنـەی ریـز ٣. ریگسـتان ۴. سبزەی کم‌عُمر بهاری

**کەوڵـەپیر** / kewłepîr/: نـاو. گوڵـێکی زەردە ☰ گُلی زرد رنگ

**کەوڵـەکۆن** / kewłekon/: نـاو. *[مەجاز، پلار]* پـیری پەککەوتە ☰ پیر لکنته

**کـەوڵـەگیـا** / kewłeg(i)ya/: نـاو. شیرگرســێن؛

ڕۆنیاسەگیا؛ سۆتیچکە 🇮🇷 شیرپنیر

**کەومار** / kewmar/: ناو. کەوەحەفی؛ باڵدارێکی خەیاڵییە دەڵێن لەشی کەو و سەری مارە 🇮🇷 پرندەای افسانەای

**کەومک** / kewmik/: ☜ کەو-١

**کەون**[1] / kewn/: ناو. دەمهەڵپێچی ژنانە 🇮🇷 نقاب زنانە

**کەون**[2]: ☜ کۆن[2]

**کەونارا** / kewnara/: ☜ کەڤنارا

**کەوندێز** / kewindêz/: ☜ کەوچێز

**کەونە** / -kewne/: ☜ کۆنە -

**کەونەلان** / kewnelan/: ناو. ١. ☜ کۆنەلان ٢. *[کنایە]* جێگای ژیانی ڕابردوو ‹ڕوو لە هەر لایە دەکەم نامۆیە بۆم/ نابینم جێژوان و کەونەلانی خۆم «هێمن»› 🇮🇷 ١. ☜ کۆنەلان ٢. محل قبلی زندگی

**کەونینە** / kewnîne/: ئاوەڵناو. کەونارا؛ زۆر قەدیمی 🇮🇷 باستانی

**کەووو** / kewû/: ☜ کەوە -٢

**کەوە** / kewe/: ناو. کۆ؛ کەوڵە؛ کەوەڵە: ١. ئابی؛ ئاوی؛ شینی ئاچخ ٢. کەوو؛ کەوک؛ کەوگ؛ شینی تۆخ 🇮🇷 ١. آبی روشن ٢. کبود

**کەوەباڕ** / kewebař/: ناو. کەواری؛ کەواڕ؛ باڕەکەو؛ کەوەباڕ 🇮🇷 جوجەکبک

**کەوەت** / kewet/: ☜ کەیکف

**کەوەحەفی** / keweĥefî/: ☜ کەومار

**کەوەدەری** / kewederî/: ☜ کەودەری

**کەوەر** / kewer/: ناو. ١. کاڕاد؛ کەورگ؛ کۆرگ؛ کەڤەر؛ کەوەری؛ کەوەرگ؛ گوڕەو؛ گوڕەد؛ کەرەسا؛ کەرەوزان؛ سەوزییەکی دەستچێنی تیژە بە گەڵای باریک و هێشوەگوڵی سپی تۆپنەوە کە بنەکەی چەند ساڵ دەمێنێتەوە ٢. ئەشکەوت؛ شکەفت 🇮🇷 ١. تَره ٢. غار

**کەوەرگ** / kewerg/: ☜ کەوەر-١

**کەوەرە** / kewere/: ناو. ١. توێژاڵکی سەر برین ٢. چینەبەردی دەوری کانی 🇮🇷 ١. کبره ٢. سنگچین پیرامون چشمە

**کەوەری** / kewerî/: ☜ کەوەر -١

**کەوەڕاو** / keweřaw/: ناو. کار و ڕەوتی ڕاو کردنی کەو 🇮🇷 شکار کبک

**کەوەڕۆژ** / keweřoj/: ناو. سپییەڕۆژ؛ ڕۆژی بێهەتاو 🇮🇷 روز ابری

**کەوەڕی** / keweři/: ئاوەڵناو. عاجز؛ ناڕەحەت؛ جاڕز 🇮🇷 پریشان

**کەوەژ** / kewej/: ناو. پێستی دەگەڵ موو هەڵکەندراو 🇮🇷 پوست با مو کندە شدە

**کەوەسێر** / kewesêr/: ئاوەڵناو. کەوێسار؛ کەوێسێر؛ ڕوخسار سپی ئاماڵ شینی ئاچخ (پەز) 🇮🇷 صورت سفید کبودفام (گوسفند)

**کەوەک** / kewek/: ناو. کاژە؛ بێچووەهەنگ 🇮🇷 زنبور عسل نابالغ

**کەوەگی** / kewegî/: ☜ کەوگی

**کەوەل**[1] / kewel/: ناو. جۆرێ بەری مازوو 🇮🇷 نوعی ثمر مازوج

**کەوەل**[2]: ئاوەڵناو. کەوەلە؛ مەیلەوشین 🇮🇷 مایل بە آبی

**کەوەلا** / kewela/: ئاوەڵناو. ١. هەموو گیان کەسک ٢. کەسک؛ سەوز 🇮🇷 ١. سبزپوش ٢. سبز

**کەوەلە** / kewele/: ☜ کەوەل[2]

**کەوەڵ** / keweł/: ناو. پێست 🇮🇷 پوست

**کەوەڵە** / kewełe/: ناو. ١. کەوگی وردیلە ٢. ☜ کەوە ٣. ڕیخەلان ٤. سەوزەلانی؛ دیمەنی سەوزی دەشت و دەر 🇮🇷 ١. کنەی ریز ٢. ☜ کەوە ٣. ریگزار ٤. سبزی دشت و در

**کەوەمار** / kewemar/: ناو. مارجەفری؛ جۆرێ ماری ئاماڵشینە لابەلا دەڕوا 🇮🇷 مار جعفری

**کەوەن** / kewen/: ناو. کوان؛ کونک؛ کوڤان 🇮🇷 دُمل

**کەوەندە** / kewende/: ناو. چادر؛ ڕەشماڵ؛ سیاماڵ؛ تاوڵ؛ کۆن؛ خێوەتی لە موو چندراو ☰ سیاەچادر

**کەوەی** / kewey/: ناو. چنگنە؛ جۆرێ گەنە ☰ نوعی کنە

**کەوەیی** / keweyî/: ناو. هەشینایی؛ کەهۆیی؛ شینی؛ ڕەنگی ئاوی تۆخ ☰ کبودرنگی

**کەوی**[1] / kewî/: ناو. ١. ڕنوو؛ ڕنی؛ کلێلە؛ هەرەس؛ شاپە ‹بە بەرگی سەوزە ڕازاوە قەد و لاپاڵ و شیو و دۆڵ/ چرۆی دەرکردووە دار و ملی دا یەکتری گیا و گۆڵ/ بە سەر بەفری کەویدا کرد شەماڵی خاکەلێوە، خۆڵ «هێمن»› ٢. داغ؛ داخی نیشان کردنی ئاژەڵ ٣. گزینگ؛ سەرەتای تاوی بەیانی ☰ ١. بهمن ٢. داغ نشانەگذاری دام ٣. اولین تابش نور خورشید

⊡ **کەوی پسان**: ڕنوو دارژانە خوار ☰ ریزش کردن بهمن

**کەوی**[2]: ئاوەڵناو. کەڤی؛ کەهی؛ کەیی؛ ڕام ☰ اهلی؛ رام

⊡ **کەوی بوون**: ڕام بوون؛ دەستەمۆ بوون؛ حەمایەت بوون. هەروەها: **کەوی کردن** ☰ رام شدن

**کەویج** / kewîc/: ☜ **کەویژ**

**کەویچە** / kewîçe/: ☜ **کەوێژە**

**کەویر** / kewîr/: ☜ **کەوگیر**

**کەویژ** / kewîj/: ناو. کەڤیز؛ کەڤیژ؛ کەویچ؛ کیوژ؛ قەفیز؛ پێوانەیەکی دەخڵە ☰ قفیز

**کەویژە** / kewîje/: ☜ **کەوێژە**

**کەویلکە** / kewîlke/: ناو. نوابەفر؛ بەفرێ کە جێ-جێ توابێتەوە ☰ برف جای-جای آب شدە

**کەوین** / kewîn/: چاوگ. پێکەوە جۆش دانی کانزا ☰ جوش دادن (فلزات)

**کەویە** / kewye/: ناو. ١. کەوی؛ ڕنوو؛ کلێلە؛ شاپە ٢. کون و خانووی نزم و نەوی ☰ ١. بهمن ٢. بام کوتاە

**کەویەبەفر** / kewyebefr/: ناو. ڕنوو؛ شاپە؛ کەڤێلە ☰ بهمن

**کەویەخ** / kewyex/: ناو. خووسار؛ خازی؛ زوقم ☰ یخ؛ سرماریزە

**کەوێ** / kewê/: ☜ **کەوا**

**کەوێت** / kewêt/: ئاوەڵناو. سەرشێت؛ تووڕە و تۆسن ‹ئەسپێکی کەوێتە، ڕاگیر کردنی زەحمەتە› ☰ سرکش

**کەوێڕیبات** / kewêř(i)bat/: کەوێ شەڕانی؛ کەوی ڕاهاتوو بۆ بانگ کردن و ڕاوی کەوانی تر ☰ کبک تربیت شدە برای شکار کبک‌های دیگر

**کەوێزڵگ** / kewêziłg/: ئاوەڵناو. ترسنۆک؛ ترسۆک ☰ ترسو

**کەوێژە** / kewêje/: ناو. کەویچە؛ کەویژە؛ دەمی پلووسکەگەنم لە ئاسیاودا ☰ دهانەی ناودان گندم در آسیا

**کەوێسار** / kewêsar/: ☜ **کەوەسێر**

**کەوێسێر** / kewêsêr/: ☜ **کەوەسێر**

**کەوێشین** / kewêşîn/: ناو. کۆترەباریکە ☰ فاختە

**کەوێڵ** / kewêł/: ناو. ١. کاز؛ کوخ؛ کۆختە؛ کۆخک؛ کۆزلاخ؛ کووژگە؛ کێل؛ کەیل؛ کەیل؛ کەیەڵ؛ قۆختە ٢. ئەشکەوت ☰ ١. کوخ؛ کلبە ٢. غار

**کەوێن** / kewên/: ئاوەڵناو. خاوێن؛ پاک ☰ پاکیزە

**کەه** / keh/: ناو. کا؛ وردەی کڵۆش ☰ کاە

**کەهال** / kehal/: ☜ **کەهاڵ**[2]

**کەهاڵ**[1] / kehał/: ناو. بۆنی خاکی ئاولێ‌پرژاو ☰ بوی خاک آب پاشیدە

**کەهاڵ**[2]: ئاوەڵناو. کەهال: ١. تەمەڵ؛ سست؛ تەوەزەل ٢. بێ‌مەیل ☰ ١. سست و تنبل ٢. بی‌میل

**کەهر** / kehr/: ☜ **کارژۆڵە**

◙ **کەهری شەمزە**: کاریلەی هەراش کە مانگی ڕێبەندان لە دایک بووە ☰ بُزغالەای کە بهمن ماه متولد شده

**کەهرە / kehre/**: ناو. هەویردە؛ کەڕەواڵە ☰ بلدرچین

**کەهرەبا / kehreba/**: ☜ کارەبا

**کەهری / kehrî/**: ناو. بزن ☰ بُز

**کەهریز / kehrîz/**: ☜ کاریز

**کەهرێز / kehrêz/**: ☜ کاریز

**کەهڕوبا / kehřuba/**: ☜ کارەبا

**کەهڕوبان / kehřuban/**: ☜ کارەبا

**کەهنی / kehnî/**: ☜ کانی[1]ـ١

**کەهنیک / kehnîk/**: ناو. قەڵماسک؛ قۆچەقانی؛ بەرەقانی ☰ فلاخن

**کەهەر / keher/**: ناو. کوێت؛ کێت؛ ئەسپی سووری ئاماڵڕەش ☰ کهر؛ اسب کمیت

**کەهەن / kehen/**: ☜ کۆن[2]

**کەهەنگ / keheng/**: ناو. بەرهەنگ؛ نەخۆشی تەنگەنەفەسی ☰ بیماری تنگی نفس

**کەهی / kehî/**: ☜ کەوی[2]

**کەهیا / kehya/**: ☜ کەیخودا

**کەهیک / kehîk/**: ناو. دەسرۆک؛ دەسماڵ؛ دەسرە ☰ دستمال

**کەهێل[1] / kehêl/**: ناو. کەحلان؛ کەحێل؛ ئەسپی ڕەسەن ☰ اسب نجیب

**کەهێل[2]**: ئاوەڵناو. کەهاڵ؛ تەمەڵ ☰ تنبل

**کەی[1] / key/**: ناو. ١. جێگە؛ شوێن ٢. داغ؛ چۆنیەتی چزان بە ئاسنی سوورەوەبوو ٣. کایە؛ یاری ٤. کاری ژەندنی تراو ٥. پاشا؛ پاتشا ☰ ١. جای ٢. داغ ٣. بازی ۴. عمل بە هم زدن مایع ۵. پادشاه

◙ **کەی پیران**: ١. ماڵە بابان ٢. کۆنە ماڵی باب و باپیران ☰ ١. خانەی پدری ٢. خانەی قدیمی اجدادی

**کەی خۆ**: ماڵەخۆ ☰ خانەی شخصی

**کەی[2]**: ئاوەڵکار. کەنگێ؛ کەدێ؛ کام کات ☰ کی؛ چە وقت

**کەی[3]**: ئامراز. کە؛ کەوا ‹تۆ خوا کەی!› ☰ کە این طور

**کەیا / keya/**: ناو. ١. کایە؛ یاری ٢. کاری ژەندنی تراو ٣. سەرناوی پیاوی خاوەن دەسەڵات ٤. ☜ کەیخودا ☰ ١. بازی ٢. عمل بە هم زدن مایع ٣. لقب شخص قدرتمند ۴. ☜ کەیخودا

**کەیارک / keyarik/**: ☜ کارگ‌ـ١

**کەیان / keyan/**: چاوگ. کەیین: ١. ژەنران؛ ژەنیان ٢. لێکەوتنەوە بە هۆی ژەندنەوە (وەک کەرە) ☰ ١. بە هم زدە شدن ٢. جدا شدن بر اثر بە هم زدە شدن (مانند کرە)

**کەیاندن / keyandin/**: چاوگ. ژەندنی تراو ☰ بە هم زدن مایع در ظرف

**کەیبڕ / keybiř/**: ناو. کەیبەر؛ جۆرێ سەرەتیری پان وەک چەقۆ ☰ نوعی پیکان لبەپهن

**کەیبەر / keyber/**: ☜ کەیبڕ

**کەیخوا / keyx(i)wa/**: ☜ کەیخودا

**کەیخودا / keyxuda/**: ناو. کخی؛ کوێخا؛ کۆخا؛ کۆخە؛ کەفخوێ؛ کەفخۆی؛ کەهیا؛ کەیا؛ کەیخوا؛ کەیکوا؛ کەیە؛ کیخا؛ کێخا؛ کێخوا؛ قوێخا؛ قۆخا: ١. گەورەی دێ ٢. *[کینایە]* پیاوی ئاقڵ و بە مشوور ☰ ١. کدخُدا ٢. مرد عاقل و مُدبر

**کەیخودایی / keyxudayî/**: ناو. قێخایی؛ کخیتی؛ کێخایی ☰ کدخُدایی

**کەیر / keyr/**: ☜ کارژۆڵە

**کەیرە / keyre/**: ☜ کەیر

**کەیس / keys/**: ناو. ١. کیس؛ کێس؛ قیس؛ دەرفەت؛ هەل؛ فرسەت؛ دەرب ٢. بەشی سەرەکی کامپیوتەر، بە شێوەیە جابەیەک

سەختامێرەکانی تێدایە ■ ۱. فُرصت ۲. کَیس

**کەیسۆ / keyso/**: ئاوەڵناو. دەرفەتهێن؛ هەلپەرست ■ فُرصت‌طلب

**کەیف / keyf/**: ناو. کێف: ۱. چۆنیەتی؛ حاڵ ۲. خۆشی؛ شادی ■ ۱. حال ۲. شادی

⊡ **کەیف کردن**: کێف کردن؛ خۆش ڕابواردن ■ کیف کردن

**کەیفخۆش / keyfxoş/**: ئاوەڵناو. کەیفەوەش؛ دڵخۆش؛ بەکەیف ■ خوشحال

**کەیفدەر / keyfder/**: ئاوەڵناو. دڵشاکەر؛ دڵخۆشیهێن ■ شادیبخش

**کەیفساز / keyfsaz/**: ئاوەڵناو. خۆشدەماخ؛ دەماخ‌تەخت؛ دڵشاد. هەروەها: **کەیفسازی** ■ سرحال؛ خوشحال

**کەیفوەش / keyfweş/**: ☜ **کەیفخۆش**

**کەیڤەشایا / keyveşaya/**: ☜ **کەیڤەشایە**

**کەیڤەشایە / keyveşaye/**: سارستە. کەیڤەشایا؛ وشەی بەڕێزەوە دواندنی ژنان ■ کلمەی خطابِ محترمانەی خانم‌ها

**کەیک / keyk/**: ناو. ۱. قێچ؛ کێچ ۲. جۆرێ شیرنی ■ ۱. کک ۲. کیک

**کەیکف / keykif/**: ناو. کەیکەو؛ کێکف؛ کێکۆ؛ کیکۆ؛ کەرکم؛ کەیکەب؛ ککەو؛ کەکەو؛ کەڤۆت؛ کەوەت؛ داری ساقەتە ئەستووری گەڵاپەنجەیی چێو تۆکمە، بە ڕەنگی سووری کاڵ و نیچکە ـ نیچکەوە کە بۆ نازک‌کاری و نەجاری بەبایەخە ■ درخت کیکُم

**کەیکوا[1] / keyk(i)wa/**: ☜ **کەیخودا**

**کەیکوا[2]**: ئاوەڵناو. کارامە و لێزان ■ کاردان

**کەیکەب / keykeb/**: ☜ **کەیکف**

**کەیکەو / keykew/**: ☜ **کەیکف**

**کەیل[1] / keyl/**: ناو. ۱. گەورەی هۆز؛ سەداری عێل ۲. کەوێڵ ■ ۱. ایلخانی؛ سردار ایل ۲. کُلبه

**کەیل[2]**: ئاوەڵناو. ۱. شۆخ و شەنگ ۲. کەیلان؛ پڕاوپڕ؛ دارماڵ ‹حەوز دەروونم کەیلەن جە هوونـاو/ مەیۆ مەویەرۆ نە چەم چوون شەتاو «مەولەوی»› ■ ۱. شوخ و زیبا ۲. مالامال

**کەیلان / keylan/**: ☜ **کەیل[2] ـ۲**

**کەیڵ / keył/**: ☜ **کەوێڵ ـ۱**

**کەین / keyn/**: لێل. ← **کەین‌وبەین**

**کەین‌وبەین / keyn û beyn/**: ناو. ۱. نێوان؛ ئاشنایەتی؛ پەیوەندی ‹کەین‌وبەینمان خۆشە› ۲. سازوباز؛ ساخت‌وپاخت؛ نەخشەیەکی نهێنی بۆ کارێکی ناڕەوا ‹ماڵە ... کە بەو کەین‌وبەینەیان زانیبوو، بە سوپاسەوە دەیانگوت تۆ نەبوایەی ئێمە نەدەماین «هەژار، چێشتی مجێور»› ■ ۱. رابطە؛ میانە ۲. توطئە

**کەینەک / keynek/**: ناو. کچ؛ دۆت؛ کەنیشک ■ دختر

**کەینەکە / keyneke/**: ناو. ۱. کەینەک؛ کچ ۲. کیژۆلە؛ کچی چکۆلە ■ ۱. دختر ۲. دخترک

**کەینەکەی / keynekey/**: ناو. کچێتی؛ کچایەتی؛ سەردەمی بەر لە شوو کردن ■ دوران دختری

**کەینێ / keynê/**: ئاوەڵکار. کەی؛ کەنگێ ■ کِی؛ چه وقت

**کەیو / keyw/**: ☜ **کادێن ـ۱**

**کەیوان / keywan/**: ناو. ۱. ☜ **کابان** ۲. ئاستان؛ کەش؛ شەشەم گەڕۆکی هەتاو کە ۹۵ ئەوندەی گۆی زەوییە و لە ۲۹ ساڵدا سوورێک بە دەوری خۆردا دەداتەوە، بە چاو دەبینرێ و ئاخڵەیەک دەورەی داوە ■ ۱. ☜ **کابان** ۲. زُحل؛ کیوان

**کەیوانو / keywanû/**: ☜ **کابان**

**کەیوانویی / keywanûyî/**: ناو. ژنایەتی؛ ماڵداری؛ ژنەتی؛ دۆخی دەس نەخشین و لێهاتوو بوونی ژن ■ کدبانویی

**کەیوانە / keywane/**: ☜ **کابان**

**کەیە** / keye/: ناو. ۱. ماڵ؛ جێگەی لێ ژیان ۲. ☜ **کەیخودا** ☱ ۱. خانه ۲. ☜ **کەیخودا**

**کەیەک** / keyek/: ناو. جلشۆری ماڵ و خێزان ☱ رختشوی منزل

**کەیەکەر** / keyeker/: ناو. ژنی زۆر ماڵدار و ئاگا لە ماڵ ☱ کدبانوی مُدبر

**کەیەکەری** / keyekerî/: ناو. بناوانی ماڵبەباشی ☱ کدبانوگری

**کەیەکی** / keyekî/: ناو. ئەو جێگەی جلکی لێ دەشۆن ☱ رختشویی

**کەیەڵ** / keyeł/: ☜ **کەوێڵ ـ۱**

**کەیەن** / keyen/: ☜ **کۆن**[۲]

**کەیەنەک** / keyenek/: ناو. جلکی کۆنی بە تیتۆڵ و بزگوڕ ☱ لباس پاره و مُندرس

**کەیەنی** / keyenî/: ناو. کۆنی؛ دۆخی کۆنە بوون ☱ کُهنگی

**کەیەوکولفەت** / keye w kulfet/: ناو. /کینایە/ ماڵ و خێزان ☱ اهل و عیال

**کەیی** / keyî/: ئاوەڵناو. ۱. ژاو؛ تێکدراو (تراو) ۲. ☜ **کەوی**[۲] ☱ ۱. به هم زده‌شده (مایع) ۲. ☜ **کەوی**[۲]

**کەییان** / keyyan/: ☜ **کادین**

**کەییر** / keyîr/: ناو. کەیرە؛ مۆرد؛ مۆرتک؛ مووورد؛ مووتک؛ موورتک؛ میتگ؛ دەوەنێکی گچکە بە گەڵای سەوز و بۆنخۆشەوە کە گوڵی سپی دەر دەکا و بەرەکەی بە قەد نۆکێکە و بۆ دەرمان ئەشێ ☱ گیاه مورد

**کەییل** / keyîl/: ☜ **کاول**[۲]

**کەیین** / keyîn/: ☜ **کەیان**

**کهار** / k(i)har/: ناو. ۱. کاریلە؛ بێچوی تازەزاوی بزن ۲. کوور؛ بزنی دوو بەهار دیتوو ☱ ۱. نوزاد بُز ۲. بُز دوساله

**کهانەی** / kihaney/: ☜ **کۆن**[۲]

**کهۆیی** / kihoyî/: ناو. ۱. کەسکایی؛ سەوزایی ڕەنگ ۲. شینی؛ کەوەیی ☱ ۱. سبزرنگی ۲. کبودی

**کهەڕ** / kiheř/: ☜ **کەڕ ـ۱**

**کهەڕۆ** / kiheřo/: ☜ **کەڕ ـ۱**

**کهەن** / kihen/: ناو. کرێژی سەر ☱ شورەی سر

**کی**[۱] / kî/: ئاوەڵکار. کێ؛ کام کەس ☱ چه کسی

**ـ کی**[۲]: ☜ **ـەکی**

**کیار** / k(i)yar/: ناو. بێستان؛ بێسانی کاڵەک و شووتی ☱ پالیز

**کیارک** / k(i)yarik/: ناو. دونبەڵان؛ دۆبەڵان؛ چمە ☱ دُنبلان

**کیاس** / k(i)yas/: ناو. کار و ڕەوتی ڕاسپاردن ☱ سفارش کردن

**کیاستن** / k(i)astin/: ☜ **کیاستەی**

**کیاستەی** / k(i)yastey/: چاوگ. کیاستن؛ کیاسەی؛ کیانای؛ ناردن؛ هەناردن؛ کل کرن ☱ فرستادن

**کیاسەی** / k(i)yasey/: ☜ **کیاستەی**

**کیاکوز** / k(i)yakûz/: ناو. بەرگەمێ؛ کووزەڵە ☱ ترتیزک آبی

**کیان** / k(i)yan/: چاوگ. ژان؛ ژەنیان؛ لێکدران ☱ به هم زده شدن

**کیانای** / k(i)yanay/: چاوگ. ناردن ‹نەورۆز گوڵ جاسووس گوڵانی تازەن/ قەهار کیانان مزانی وازەن «سەیدی»› ☱ فرستادن

**کیانیای** / k(i)yanay/: چاوگ. نێردران؛ هەناریان ☱ فرستاده شدن

**کیبڵە** / kîbłe/: ☜ **قیبلە**

**کیپ** / kîp/: ئاوەڵناو. کپ؛ مووبڕ؛ بەبێ مەودا و بۆشایی ☱ کیپ

**کیپا** / kîpa/: ناو. کیپار؛ کیپاری؛ گیپە؛ گەگگ؛ پارچە کرشی پڕکراو لە ساوار یان برنج و کولێندراو ☱ گیپا

**کیپار / kîpar/**: ☜ کیپا

**کیپاری / kîparî/**: ☜ کیپا

**کیتکە / kîtke/**: ناو. کولێرەی هەرزن ≡ گردەنان ارزنی

**کیتە / kîte/**: ناو. دیزە؛ دەفری قووڵی سواڵەت ≡ دیزی؛ دیگ سُفالین

**کیتەڵە / kiteɫe/**: ناو. کاتیلە؛ دیزەی چکۆلە ≡ دیزی کوچک

**کیچە / kîçe/**: ناو. کووچە؛ کۆلان؛ کووجی ≡ کوچه

**کیخا / kîxa/**: ☜ کەیخودا

**کیخی / kîxî/**: ناو. کوێخای داندراوی دەوڵەت لە ناوچەیەکدا ≡ کدخدای انتصابی دولت

**کیر / kîr/**: ناو. *[شوورەیی]* کێر؛ چووک؛ سیرەت ≡ کیر؛ آلت تناسلی نر

**کیراسو / kîrasu/**: ناو. هەوێردە؛ کەرەواڵە ≡ بلدرچین

**کیرپک / kîrpik/**: ناو. کەپەک؛ کرپک ≡ نُخاله

**کیرک / kîrik/**: ناو. کورک؛ کووروو؛ کوڵک ≡ کُرک؛ موی نرم زیر پشم

**کیرکەڵە / kîrkeɫe/**: ناو. کەڵە؛ گیاکەڵە ≡ انگل توتون و پالیز

**کیرکەڵەگا / kîrkeɫega/**: ناو. *[ناشیرین]* چلوورەی دەمپلووسک ≡ قندیل آویزان از ناودان

**کیرۆ / kîro/**: ☜ کوێرۆ

**کیرە / kîre/**: ☜ کورەخانە

**کیرەوڵ / kîrewiɫ/**: ناو. *[شوورەیی]* ئەو شوێنەی کیری جوانەگا و پاتاڵی نێری لێ دێتە دەر ≡ جایی که آلت تناسلی حیوان نر از آن بیرون می‌آید

**کیڕ[1] / kîř/**: ناو. ١. ڕەوتی قرچان؛ پێستەت هەڵقرچان لە سووتان ٢. ڕووش؛ ڕووک؛ خاشە ≡ ١. چروک پوست در اثر سوختگی ٢. خراش

**کیڕ[2]**: ناوەڵناو. ١. شووم؛ بێفەڕ ٢. کاڵ؛ نەگەیشتوو ≡ ١. نحس ٢. کال

**کیڕاندن / kîřandin/**: چاوگ. کیڕانن: ١. ڕێخشاندن ٢. کیڕ تێخستن ≡ ١. ساییدن ٢. خش انداختن

**کیڕانن / kîřanin/**: ☜ کیڕاندن

**کیڕە / kîře/**: دەنگەناو. دەنگێکی گوێ ئازاردەر کە زۆرتر لە هەڵکەنرانی شتی زبر و سەخت یان ڕێ خشانەوە بەدی دێ ≡ صدای کشیده شدن و خراشیدن

**کیڕیاگ / kîřyag/**: ناوەڵناو. ڕووشاو؛ ڕووشیاو؛ ڕووکاو؛ مەڕتاو ≡ خراشیده

**کیڕیاگی / kîřyagî/**: ناوەڵناو. ڕووشاوی؛ ڕووشیاوی؛ ڕووکاوی؛ مەڕتاوی ≡ خراش

**کیڕیان / kîřyan/**: چاوگ. پێداخشان و ڕووشان ≡ کشیده شدن و خراشیدن

**کیز / kîz/**: ناو. ١. کووز؛ قاش لە میوە ٢. زەمینی تمتمان و ڕەق ≡ ١. قاچ میوه ٢. زمین سنگلاخی

**کیزاخە / kîzaxe/**: ناو. ڕۆپل؛ هەڵپیت؛ شخەڵ ≡ هَرَس

**کیژ / kîj/**: ناو. ١. کچ؛ کەنیشک؛ کەچ؛ دۆت؛ قیز ‹بژاری چەند ناخۆش و وردە/ پێشەی کوڕ و کیژی کوردە «مەلا ئاوارە»› ٢. کیڕ؛ ڕەوتی قرچانی پێست ≡ ١. دُختر ٢. چروکیدگی پوست

**کیژان / kîjan/**: ناوەڵناو/ ناوەڵکار. کیشک؛ کام؛ کێهە ‹لە دۆتی زیندەبەگۆڕیش پرسیار کرا: بە کیژان گونەهـ گوژاوە؟ «هەژار، *قورئان*»› ≡ کُدام

**کیژک / kîjik/**: جێناو. کامە؛ کامی ≡ کدامی

**کیژکاوڕ / kîjkawiř/**: ☜ کشکەوڕ

**کیژکە / kîjke/**: ناو. چۆلەکە؛ چوێلەکە ≡ گنجشک

**کیژکی / kîj(i)kî/**: جێناو. کامە؛ کامین ≡ کدامین

**کیژوڵە / kîjuɫe/**: ناو. چێشکە؛ چۆلەکە ≡ گُنجشک

**کیژۆڵە / kîjoɫe/**: ناو. کچی چکۆلە ‹هەر

تەژەیەکی ملهوڕ و مەندەبۆر و خاوەن زێڕ و زۆر بوایە، کیژۆڵەی کوردی چاوشین و قژزێڕینی هەڵبژاردەی، بە دیارده هەڵدێنا و بۆ خۆی دەبردن «هەژار، *شەرەفنامە*» 🇮🇷 دخترک

**کیس**[1] / kîs/: ناو. کێس: ۱. قیس؛ ڕادەست؛ جێگایەک کە بە سانایی دەستی پێ بگا ۲. هەل؛ دەرفەت؛ فرسەت ۳. کەڵک؛ مفا؛ فێدە ٤. ئەستووری پدوو 🇮🇷 ۱. دسترس ۲. فُرصت ۳. فایده ۴. آماس لثه

⊡ **کیس کردن:** کێس کردن: ۱. پەنەمانی پدوو ۲. پیش خواردنەوەی تووڕەیی 🇮🇷 ۱. آماسیدن لثه ۲. خشم را فروخوردن

**لە کیس دان:** لە کەڵک بردن/ خستن. هەروەها: **لە کیس چوون** 🇮🇷 از فایده انداختن

**کیس**[2]: ئاوەڵناو. کێس؛ شاراوە؛ پێوار 🇮🇷 پنهان

**کیساندن** / kîsandin/: چاوگ. شاردنەوە؛ شیش کردن 🇮🇷 پنهان کردن

**کیسک** / kîsik/: ناو. کیسە: ۱. توورەکەی چکۆڵەی تووتن ۲. جزدانی باخەڵ 🇮🇷 ۱. کیسەی کوچک توتون ۲. کیف پول

**کیسۆ** / kîso/: ☜ **کیسەڵ**

**کیسۆبزنە** / kîsobizne/: ☜ **کەرتەشی**

**کیسە** / kîse/: ناو. ۱. ☜ **کیسك** ۲. دەسکێشێکی زبرە لە حەمام خۆی پێ دەشۆن ۳. گیرفان؛ گیفان؛ کێمانی ٤. توورە؛ گۆنی چکۆلە 🇮🇷 ۱. ☜ **کیسك** ۲. کیسەی حمام ۳. جیب ۴. کیسە

⊡ **کیسە کێشان:** شتنی لەش بە کیسەی حەمام 🇮🇷 کیسە کشیدن

**کیسە هەڵدرون** (**بۆ شتێ**): *[کنایە]* بە هومێد بوون بۆ شتێ کە وێدەچێ لە داهاتوودا بگات (زیاتر بە ناڕەوا) 🇮🇷 کیسە دوختن (برای چیزی)

**کیسەباخەڵ** / kîsebaxeł/: ناو. جزدان؛ کیسەی چەرمین بۆ پووڵ تێ نان 🇮🇷 کیف بغلی

**کیسەبڕ** / kîsebiř/: ناو. *[کنایە]* جێوبڕ؛ دزێ کە بەریک دەبڕێ و پارە دەدزێ 🇮🇷 جیببُر

**کیسەبیمار** / kîsebîmar/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دەسکورت؛ هەژار 🇮🇷 فقیر

**کیسەکێش**[1] / kîsekêş/: ناو. کەسێ کە لە حەمام کیسە دەکێشێ و خەڵک دەشوا 🇮🇷 دلاک حمام

**کیسەکێش**[2]: ئاوەڵناو. *[کنایە، پلار]* زمانلووس و بەکلکەسووتە 🇮🇷 چاپلوس

**کیسەلەمل** / kîselemil/: ناو. *[کنایە]* کچی جوان لە ماڵی باوک 🇮🇷 دختر زیبا در خانەی پدری

**کیسەڵ** / kîseł/: ناو. کاسەپشت؛ کسل؛ کووسەڵ؛ کووسەلە؛ کووسی؛ کەسا؛ کەسە؛ کەسەپشت؛ کەسەل؛ کەوسەڵ؛ کیسۆ؛ کیسی؛ کینفس؛ کیسسوو؛ جانەوەرێکە قاپێلکێکی ڕەقی بۆری خاڵ ـ خاڵی هەیە، زستانان لە بن خاکا دەخەوێ و لە بەژ و وشکانیدا دەژی و ئاوژیشی هەیە 🇮🇷 لاکپشت

**کیسەڵبەخش** / kîsełbexş/: ☜ **کیسەڵپسەکێن**

**کیسەڵپسەکێن** / kîsełp(i)sekên/: ناو. کیسەڵبەخش؛ کیسەلەگزین؛ گەمەیەکی لاوانی گوندنشینە 🇮🇷 از بازی‌های جوانان روستایی

**کیسەلە**[1] / kîsele/: ناو. ۱. ئامرازێکی قفڵی دارینی درگا ۲. سن؛ سون؛ بەڵای گەنم ۳. جانەوەرێکی چکۆلەی وەک کیسەڵە کە ئافەتی دار و درەختە ٤. نەخۆشییەکی جەرگی پەزە، لوویەکی سپی پڕ لە چلک لە سەر جەرگی بەدی دێت 🇮🇷 ۱. ابزاری در کلون در ۲. حشرەی سن آفت غلە ۳. خزندەای کوچک شبیە لاکپُشت ۴. غدەی سفید چرکی کە روی جگر گوسفند پیدا می‌شود

**کیسەلە**[2]: ئاوەڵکار. پێدزە؛ پێخشکە؛ پاچرکێ؛ خۆ مات کردن و بە دزەدز هاتنە پێش 🇮🇷 پاورچین

**کیسەلەگزین** / kîseleg(i)zîn/: ☜ **کیسەڵپسەکێن**

**کیسەوکەمەر** / kîse w kemer/: ناو. جۆرێ

پشتێندی چەرم کە پارەی تێدا جێ دەکەنەوە ☰ همیان؛ نوعی کمربند

**کیسی / kîsî/:** ☜ **کیسەڵ**

**کیش / kîş/:** دەنگەناو. کش؛ وشەیەک لە شەترەنجدا کە لە کاتی تەنگ پێ‌هەڵچنینی شای خەنیم دەگوترێ ☰ کیش شطرنج

**کیشتا / kîşta/:** ☜ **کوژراو**

**کیشک / kîşk/:** ☜ **کیژان**

**کیشکە / kîşke/:** ناو. چۆلەکە؛ چوێلەکە ☰ گنجشک

**کیشیای / kîşyay/:** چاوگ. کێشران؛ کێشیان ☰ کشیده شدن

**کیف[1] / kîf/:** ناو. ١. ئامێرێکی ناوبۆشی زۆرتر چوارگۆش کە دەکرێتەوە و دەبەسرێ و لە ماکێکی نەدەڵێن (وەک: چەرم و ...) درووست دەکرێ، بۆ تێ‌نانی شتومەکی پێویست و ئامرازی کار یان چکۆلەی بۆ جێگای پارە و کارت و ... ٢. ☜ **کەڕو** ☰ ١. کیف ٢. ☜ **کەڕو**

⊡ **کیف کردن:** کەف کردن؛ تویژ پەڕینە سەر ترشاو ☰ کفک زدن

**کیف[2]:** ئاوەڵناو. شووش و لەبار و بەژن‌زراو ☰ رعنا

**کیف[3]:** دەنگ. دەنگی مار ☰ صدای مار

**کیفار / kîfar/:** ناو. کیفوار؛ گیایەکی بەرزی دڕکاوییە لاسکەکەی بە شلکی دەخورێ ☰ گیاهی خاردار

**کیفاندن / kîfandin/:** چاوگ. تێپەڕ. //کیفاندت؛ دەکیفێنی؛ بکیفێنە// کیفانن؛ فیکە کردن (وەک دەنگی مار) ☰ سوت کشیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەکیفاندن

**کیفانن / kîfanin/:** ☜ **کیفاندن**

**کیفدەم / kîfdem/:** ئاوەڵناو. دەمتاک؛ ڤال؛ گووپ‌گوشاد ☰ دهن‌گُشاد

**کیفزال / kîfzal/:** ☜ **قرژانگ**

**کیفژاڵ / kîfjał/:** ☜ **قرژانگ**

**کیفژاڵە / kîfjałe/:** ناو. نەخۆشی شێرپەنجە ☰ سرطان

**کیفش / kîfş/:** ئاوەڵناو. ئاشکرا؛ خۆیا ☰ پیدا

**کیفشینگ / kîfşîng/:** ☜ **قرژانگ**

**کیفکۆ / kîfko/:** ناو. دۆک؛ دۆکە؛ شۆک؛ شۆکەی بەلای گەلای بێستان و ڕەز ☰ سپیدک

**کیفن / kîfin/:** ئاوەڵناو. ترشاوی برشاوی ☰ تُرشیدەی کفک‌زدە

**کیفوار / kîfwar/:** ☜ **کیفار**

**کیفۆک / kîfok/:** ناو. پیفۆک ☰ گیاهی با پیازەی خوردنی

**کیفە / kîfe/:** دەنگەناو. دەنگی هێواش و درێژ وەک دەنگی ڕاخوشینی مار ☰ صدای آرام و پیوستە مانند صدای خزش

**کیفەکیف / kîfekîf/:** دەنگەناو. دەنگی کیفەی پشت سەر یەک ☰ صدای آرام و پیوستەی پیاپی

**کیڤار / kîvar/:** ناو. قرێژی ئەستووری سەری کەچەڵ ☰ شورەی غلیظ سرِ کچل

**کیڤروشک / kîvruşk/:** ☜ **کەروێشك**

**کیڤریشک / kîvrîşk/:** ☜ **کەروێشك**

**کیڤژاڵ / kîvjał/:** ناو. گیڤژاڵ؛ کیڤژاڵە؛ گیژاڵ؛ قرژاڵ؛ قرژانگ ☰ خرچنگ

**کیڤژاڵە / kîvjałe/:** ☜ **کیڤژاڵ**

**کیڤەچەر / kîveçer/:** ناو. پووش‌وپارێ کە پاوانی کەس نەبێ ☰ چراگاه آزاد

**کیک / kîk/:** ☜ **کام[2]**

**کیکۆ / kîko/:** ☜ **کەیکف**

**کیل / kîl/:** ئاوەڵناو. ١. کول؛ نەبڕ ٢. خێل؛ خوێل ☰ ١. کُند ٢. لوچ

**کیلک / kîlik/:** ناو. ١. کلک؛ قامک؛ ئەنگوست؛ ئەموست؛ تبل؛ تلی؛ تل ٢. قەڵەم؛ کلک ٣. ڕیپۆقی چاو ☰ ١. انگشت ٢. قلم ٣. ژفک؛ قی چشم

**کیلـۆ** / kîlo/: نـاو. ١. هـەزار ٢. *[سەرزارەکی]* کیلۆگرەم ☰ ١. هزار ٢. کیلوگرم

**کیلـۆگرەم** / kîlog(i)rem/: ناو. یەکـەی سـەرەکی کێشانە لە سیستەمی میتریکدا، بەرامبەر بە هەزار (١٠٠٠) گرەم ☰ کیلوگرم

**کیلـۆمیتر** / kîlomîtr/: ناو. یەکـەی درێژایـی لـە سیستەمی میتریکدا بەرانبـەر بـە هـەزار (١٠٠٠) میتر ☰ کیلومتر

**کیلۆن** / kîlon/: ناو. کێلوون؛ قفڵ ☰ قفل

**کیلە**[1] / kîle/: ناو. کەیل؛ کیل ☰ پیمانەی غلە

**ـ کیلە**[2]: پاشگر. بـۆ چـووک نیشـاندان و خـۆش ویستن ‹جوانکیلە› ☰ پسوند تصغیر و تحبیب

**کیلەر** / kîler/: ناو. کولێن؛ جێگەی ئازوقە ☰ جای آذوقە

**کیلەفڕ** / kîlefiř/: ناو. خەتەجووتی لە یـەکتر دوور ☰ شیارهای دور از هم در شخم

**کیلەڤڕ** / kîleviř/: ناو. قەمچان؛ گەمەیەکە بە پێنج زیخ دەکرێ ☰ بازی یک‌قُل‌دوقُل

**کیلەمەن** / kîlemen/: ناو. پێوانە؛ پەیمانە؛ پێوەر ☰ پیمانە

**کیڵ** / kîł/: ناو. کەیل؛ پێوانـەی دەخـڵ لـە دار ☰ پیمانەی چوبین غلە

**کیم** / kîm/: نـاو. کیماو؛ زەرداو و زووخـاوی بـرین ☰ ریم؛ خونابەی زخم

**کیماو** / kîmaw/: ☜ **کیم**

**کیمخا** / kîmxa/: ناو. ١. فیز؛ چۆنیەتی لە خۆ بایی بوون ٢. ☜ **کیمخوا** ☰ ١. از خود راضـی بـودن ٢. ☜ **کیمخوا**

**کیمخـوا** / kîmx(i)wa/: نـاو. کیمخـا؛ کێمخـوا؛ کێخمـە؛ پارچەیـەکی ئاوریشـمی ☰ پارچـەای ابریشمی

**کیمیا** / kîmya/: ناو. شـیمی؛ زانسـتی پێکهاتـەی بنەمایی ماک و تێکـئاڵاوی، گـۆڕان، پێکهـاتن، کاردانەوە، شیکاری و بەرهەم هێنانی ماکگەل ☰ شیمی

**کیمیازان** / kîmyazan/: ☜ **کیمیاگەر ـ٢**

**کیمیاگەر** / kîmyager/: ناو. ١. کەسێ کە خولیای کردنـە زێـڕی مسـە ٢. کیمیـازان؛ شـیمی‌زان؛ ئەوەی لە سەر شیمی و ڕەوتەکانی دەکۆڵـێتەوە ☰ ١. کیمیاگر ٢. شیمیدان

**کیمیـاوی** / kîmyawî/: ناوەڵـناو. شـیمیایی ☰ شیمیایی

**کیمیـایی** / kîmyayî/: ناوەڵـناو. ١. سـەر بـە کـار و زانستی کیمیا ‹چەکی کیمیایی› ٢. تایبەتمەندی شتێ کە بە دەگمەن دەس کەوی ٣. *[کینایە]* زۆر بە قازانج ☰ ١. شیمیایی ٢. نادر و کمیاب ٣. بسیار پرسود

**کین**[1] / kîn/: ناو. ڕک؛ قین؛ قار ☰ کینە

**کین**[2]: ناوەڵکار. کوێ؛ کام جێگە ☰ کُجا

**کیناوی** / kînawî/: ناوەڵـناو. دوشقان؛ قـین لـە دڵ ☰ کینەتوز

**کینایە** / kînaye/: ناو. پەردەک: ١. *[وێژە]* وتەیەک کە دوو بـاری هەیـە و لـە مانـای ڕواڵـەتییەکەی مانایـەکی شـاراوە دەردەکـەوێ (وەک ئـەوەی بگوترێ «کابرا دەستی بە دەمـی ناگـا» واتـا دەسـت کورت و نەدارە) ٢. گۆشە؛ زیپک؛ وتەیەک وێـڕای سووکایەتی یا گاڵـتە (وەک: سووکەسـەر) ☰ ١و٢. کنایە

**کینفس** / kînfis/: ☜ **کیسەڵ**

**کینگ** / kîng/: ناو. *[شوورەیی]* قنگ؛ قوون ☰ کون

**کینە** / kîne/: ناو. ڕک؛ کین ☰ کینە

**کینەدار** / kînedar/: ☜ **کینەکێش**

**کینـەکێش** / kînekêş/: ناوەڵناو. کینـەدار؛ ڕکـوونی؛ ڕکهەڵگر؛ ڕک لە زگ ☰ کینەتوز

**کیو** / kîw/: ☜ **کادێن ـ١**

**کیـوار** / kîwar/: ناو. کیفـار؛ گیایەکـە دڕکـاوی ☰

گیاهی خاردار

**کیور / kîwir/:** ☜ **کاهو**

**کیوون / kîwûn/:** ناو. ١. کوتکی ئاسن بۆ بەرد شکاندن ٢. لاسکەگیای باریکی کلۆر ☰ ١. پُتک آهنین ٢. ساقەی باریک و کاوک گیاه

**کیوەر / kîwer/:** ☜ **کاهو**

**کیە / k(i)ye/:** ناو. ١. ترۆپ؛ چلەپۆپە؛ بەرزترین شوێنی کێو ٢. ڕێژاو؛ ڕەزاو؛ دواوان؛ شوێنی تێکەڵ بوونی چۆم دەگەڵ دەریا یان چۆمی تر ٣. ڕیزەکەلەکی دەوری ڕێژاو ٤. ماڵ؛ خانوو؛ یانە ☰ ١. قُله ٢. مصب رودخانه ٣. سنگچین پیرامون مصب رودخانه ۴. خانه؛ مسکن

**کیەر / k(i)yer/:** ناو. ١. ☜ **کارژۆڵە** ٢. گدە؛ بزە؛ بزن ☰ ١. ☜ **کارژۆڵە** ٢. بُز

**کییور / kîyur/:** ☜ **کاهو**

**کییەر / kîyer/:** ناو. بزن؛ بز ☰ بُز

**کێ[1] / kê/:** ناو. ١. ناوی بیستودووەمین پیتی ئەلفوبێی زمانی کوردی ٢. بارەی ژاندن بۆ جارێک ‹کێی مەشک› ٣. خانوو؛ یانە؛ کەی؛ ماڵی تێدا ژیان ٤. درگا (ماڵ و چەپەر و ...) ☰ ١. ک؛ نام بیستودومین حرف الفبای زبان کُردی ٢. بهرەی یک بار به هم زدن مَشک ٣. خانه؛ مسکن ۴. در (خانه و پرچین و ...)

**کێ[2]:** جێناو. ١. وشەی پرسیار بۆ ناسینی کەسێ ‹کێ بردی؟ کێیان کێشایە دار؟ ڕێت لە کێ گرت؟› ٢. هەرکەس؛ ئەوەی ‹کێ زانیی با بۆ ئەو بێ› ☰ ١. چه کسی ٢. هرکس؛ هرکه

**• کێ[3]:** پاشگر. لە پێکهاتەکاندا دەکەوێتە پاشەوەی ڕەگی کار بۆ ناوی چاوگ و چەشنێ هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی ‹چاوشارکێ؛ هەڵپەڕکێ› ☰ سازندەی اسم مصدر با اضافه شدن به ریشەی مصدر

**کێبەرکێ / kêberkê/:** ناو. ملە؛ ڕکبەڕکە لە یاری یان کارێکدا ☰ مسابقه

**کێبەرکێکار / kêberkêkar/:** ناو. هەڤڕک ☰ حریف (در بازی)

**کێبەرکێکەر / kêberkêker/:** ناو. غەنیم؛ غەنیو؛ هومال؛ هاوچاو ☰ رقیب

**کێبەکێیی / kêbekêyî/:** ناو. هەرکەس هەرکەسی؛ تێکەڵپێکەڵی؛ شپرزی؛ شێوای ☰ هرجومرج

**کێت / kêt/:** ناو. کوێت؛ کوێتە؛ کەهر؛ ئەسپی سووری ئاماڵڕەش ☰ اسب کمیت

**کێتک / kêtik/:** ☜ **کتك**

**کێتە / kête/:** ناو. ١. تێلا؛ بەرچیغ؛ داردەستی ئەستوور ٢. قایمەمێو؛ داربەستی داری ترێ ☰ ١. چُماق ٢. داربست تاک

**کێچ / kêç/:** ناو. قێچ؛ کەیک؛ مێروویەکی چکۆلەی خۆشبەزە، پێگەیشتووەکەی لە خوێنی پەلەوەران و مۆرغەداران دەژی ☰ کک

▣ **کێچی دەریا:** مەیگوو؛ ئەنگوش؛ جۆرێ قرژاڵۆکەی دەپایە لە تیرەی ڕەقپێستان بە چنگاڵی درێژی دڕکاوییەوە ☰ میگو

▣ **کێچ کردنە گا:** *[مەجاز]* کا کردنە کێو؛ گەورە کردنەوەی لە ڕادەبەدەری شتێک ‹جا مەگەر درۆ دروست کەم، یان بێخەبەر ... مل لە فڕ و فیشاڵ نیم و کێچ بکەم بە گا! «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ یک کلاغ چل کلاغ کردن

**کێچ کەوتنە کەوڵی کەسێ:** *[کینایە]* کێچ هەڵێنان؛ لە ترس یان هەوڵ وە پەلە کەوتن ‹ئەمجار خەیاڵمان کرد کە ڕەنگە شای ئێرانیش لەبەر ناسر، کێچ بکەوێتە کەوڵی و ڕادیۆی کوردی دامەزرێنێ «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ کک به تُنبان کسی افتادن

**کێچ لە کەوڵ کەوتن:** ☜ **کێچ هەڵێنان**

**کێچ ناڵ کردن:** *[مەجاز]* زۆر فێڵەباز بوون ☰ شیاد و کلاهبردار بودن

**کێچ هەڵێنان:** کێچ لە کـەوڵ کـەوتن: ١. کـێچ پەیدا بوون لە شوێنێ ٢. *[کینایە]* کەوتنە ترس و پەلەوە ☰ ١. کک بە جایی راه یافتن ٢. کـک بـە تُنبان افتادن

**کێچەڕەشکە / kêçeřeşke/:** ناو. مێـرووی وردیلـەی بەڵای بێستان ☰ حشرەی آفت پالیز

**کێخ / kêx/:** ناو. ١. چڵک؛ پیسی ٢. چرکی بـرین ☰ ١. کثافت؛ چرک ٢. چرک زخم

**کێخا / kêxa/:** ☜ **کەیخودا**

**کێخایی / kêxayî/:** نـاو. قێخـایی؛ کـەیخودایی ☰ کدخُدایی

**کێخمە / kêxme/:** ☜ **کیمخوا**

**کێخوا / kêx(i)wa/:** ☜ **کەیخودا**

**کێـر / kêr/:** نـاو. ١. *[شـوورەیی]* کـیر؛ چـووک؛ ئەندامی زاوزێـی نێـر ٢. کێـرد؛ چـەقۆ؛ کـارد ٣. ئیش؛ کار ٤. فایدە؛ بەهرە ☰ ١. کیر؛ آلت تناسـلی نر ٢. کارد ٣. کار ۴. فایده

⊡ **کێر هاتن:** کێراتن؛ بە کار هاتن؛ بەکەڵک بوون ‹ئەو ماڵە کێر نایە› ☰ بە کار آمدن

**کێرات / kêrat/:** ناو. دەوەنێکە ☰ درختچەای است

**کێراتـی / kêratî/:** ئاوەڵناو. بەبەهرە؛ بـەکارهاتوو ☰ مُفید

**کێراکی / kêrakî/:** ناو. پازار؛ ڕۆژی یەکـشەممە ☰ یکشنبه

**کێـران[١] / kêran/:** نـاو. داری درێـــژ و ئەســـتووری بانەڕای خانوو ☰ دیرک افقی سقف خانه

**کێران[٢]:** ئاوەڵناو. زەبەلاح؛ زرتەبۆز ☰ لندهور

**کێـرانن / kêranin/:** چـاوگ. پێـــدا هێنــــان و ڕووشاندن ☰ خراشیدن

**کێربڕ / kiřbiř/:** ناو. چووکبڕ؛ خەتەنەکـەر؛ ئـەوی منالان سونەت دەکا ☰ ختنه‌کننده

**کێرخۆر / kêrxor/:** ناو. *[ناشیرین]* ١. حیز؛ جنـدە ٢. قووندەر؛ بەپشت ☰ ١. فاحشه ٢. کونی

**کێرد / kêrd/:** ناو. چەقۆ؛ کارد؛ کێر ☰ کارد

**کێردکەر / kêrdker/:** نـاو. چەقۆســاز؛ چەقۆگـەر؛ وەستای کێردان ☰ چاقوساز

**کێردگەر / kêrdger/:** ناو. چەقۆساز ☰ کاردساز

**کێردی / kêrdî/:** ☜ **کاردوـ١**

**کێرزل / kêrzil/:** ئاوەڵناو. *[ناشیرین]* ١. سیرەتزەلام ٢. *[کینایە، پلار]* کەڵەگا؛ ملهوڕ؛ زۆرکـار ☰ ١. کیـر کلفت ٢. زورگو

**کێرزلـی / kêrz(i)lî/:** نـاو. *[ناشـیرین، کینایـە، پـلار]* زۆرکاری؛ ملهوڕی ☰ زورگویی

**کێرستون / kêristun/:** ☜ **کێڕستون**

**کێرستون / kêristûn/:** ☜ **کێڕستون**

**کێرسم / kêrsim/:** نـاو. ڕەوش؛ دام و دەسـتوور ☰ روش

**کێرقـازی / kêrqazî/:** نـاو. گیایـەکی گەلاپانـە بـە ڕەنگی بەنەوشی تۆخ ☰ گیاهی است

**کێرک / kêrik/:** نـاو. قەڵەمبڕ؛ چەقۆی پچـووک ☰ کارد کوچک؛ قلمتراش

**کێرکار / kêrkar/:** ☜ **کارەکەر**

**کێرکەر / kêrker/:** ☜ **کارەکەر**

**کێرکەڵـە / kêrkełe/:** نـاو. کێرکەڵــەگا؛ کەڵــەی تووتن و بێستان ☰ گیاهی است آفت و انگل توتون و پالیز

**کێرکەڵـەگا / kêrkełega/:** نـاو. *[ناشـیرین]* ١. ☜ **کێرکەڵە** ٢. کیری وشکەوە کراوی گا کە قەڵـەمی قامیشیان لە سەر دەقرتانـد ☰ ١. ☜ **کێرکەڵە** ٢. نوعی مقطع قلم نی

**کێرگو / kêrgû/:** ☜ **کەروێشك**

**کێرمـەخمـەر / kêrmexmer/:** ئاوەڵـناو. *[شـوورەیی]* ساتەری؛ بـە کـار هێنـەری کـیری دەسـکرد ☰ استعمال کننده‌ی آلت مصنوعی

**کێرنج / kêrinc/:** نـاو. هەلاج؛ کەسێ کە کولـکە و پەمۆ شی دەکاتەوە ☰ پنبه‌زن

**کێروشک** / kêrwişk/: ناو. هەروێ؛ خەروێ؛ کەروێشک ▪ خرگوش

**کێرۆ**[١] / kêro/: ☜ **کوێرۆ**

**کێرۆ**[٢]: ☜ **کوێرگ**[٢]

**کێرووشک** / kêrûşk/: ☜ **کەروێشک**

**کێرووشکە** / kêrûşke/: ☜ **کەروێشکە**

**کێرە** / kêre/: ناو. کێری؛ مەشکەی لە دار یان لە تەنەکە لە جیاتی مەشکەی پێست ▪ مشک چوبین یا حلبی

**کێرەفیل** / kêrefîl/: ناو. *[ناشیرین]* ١. *[پەلار]* هەر شتێکی ناقۆلا و کرێت ٢. قامچی هۆنراو لە چەرم ▪ ١. هر چیز زشت منظر ٢. تازیانەی بافته از چرم

**کێرەگا** / kêrega/: ناو. چۆپ؛ ڕەگی کێری گا، وشک دەکرا و دەکرایە برگە بۆ قەڵەم دادان ▪ مقطع قلم نی که از ذکر خشکیدەی گاو می‌ساختند

**کێرهەستاو** / kêrhestaw/: ئاوەڵناو. *[شووورەیی]* ئێرەق ▪ نعوذ شده

**کێری** / kêrî/: ناو. ١. ملەی کێو؛ شانی چیا ٢. ☜ **کێرە** ▪ ١. ستیغ کوه ٢. ☜ **کێرە**

**کێریشک** / kêrîşk/: ☜ **کەروێشک**

**کێڕ**[١] / kêř/: ناو. هێڵ؛ خەت ▪ خط

**کێڕ**[٢]: ☜ **کەڕ-١**

**کێڕستوون** / kêřstûn/: ناو. کێرستوون؛ کێرستون؛ هەسێرەزێڕینە ▪ رنگین‌کمان

**کێڕنای** / kêřnay/: چاوگ. کڕاندن؛ ڕووشاندن ▪ خراشیدن

**کێڕی** / kêřî/: ئاوەڵناو. هەسوویی؛ ڕاست و لە درێژەوە ▪ افقی

**کێڕیای** / kêřyay/: چاوگ. کڕدران؛ ڕووش بوون ▪ خراشیدن

**کێز**[١] / kêz/: ناو. قالۆچە؛ قۆلانچە ▪ سوسک

**کێز**[٢]: پاشەوشە. ـ ژەن؛ ـ ژان؛ کاری لێکدانی تراو ‹مەشکەکێز› ▪ ـ زن

**کێزان** / kêzan/: چاوگ. کێزین؛ ژان؛ لێکدرانی تراو ▪ به هم زده شدن مایع

**کێزاندن** / kêzandin/: چاوگ. کێزراندن؛ ژاندن؛ ژەندن ▪ به هم زدن مایع

**کێزر**[١] / kêzir/: ناو. کێزەر: ١. کاری کێزان؛ ژەندن ٢. سکڵ؛ پۆلوو ٣. بە پڕی ڕواو لە جێگەیەک ٤. پیرەداری مازوو یان بەڕوو ▪ ١. عمل به هم زده شدن مایع ٢. اخگر ٣. روییدەی انبوه ۴. درخت پیر بلوط یا مازوج

**کێزر**[٢]: ئاوەڵناو. کێزەر؛ گوێنەدەر؛ کاری سەربەخۆکەر ▪ خودسر

**کێزراندن** / kêzirandin/: ☜ **کێزاندن**

**کێزری** / kêz(i)rî/: ناو. بەرهەڵدایی و کاری سەربەخۆ ▪ خودسری

**کێزک** / kêzik/: ناو. قالۆچە؛ ڕیخ‌گلێنە؛ گووبەرە؛ گووخلێنکە ▪ سرگین‌غلتان

**کێزگ** / kêzig/: ناو. مێشی پاقلە ▪ مگس آفت باقلا

**کێزم** / kêzim/: ناو. ١. دەستەکەدار ٢. دارێکە وەبەر داری ڕەزی دەدەن ▪ ١. چوب کوبیدن در پرچین ٢. چوبی که تکیه‌گاه تاک می‌شود

**کێزن** / kêzin/: ناو. کێزین؛ حوشترگەڵوو؛ بۆڕی ئاوی لە سواڵەتی سوورەوەکراو ▪ شترگلو

**کێزە** / kêze/: ناو. قالۆچە؛ قۆلانچە ▪ سوسک

**کێزەر** / kêzer/: ☜ **کێزر**

**کێزەکە** / kêzeke/: ☜ **کووزەڵە**

**کێزی** / kêzî/: ناو. جاڕوو؛ گەسک ▪ جارو

**کێزین**[١] / kêzîn/: ☜ **کێزان**

**کێزین**[٢]: ☜ **کێزن**

**کێژکە** / kêjke/: ناو. چۆلەکە؛ چوێلەکە ▪ گنجشک

**کێژۆڵە** / kêjołe/: ناو. چۆلەکە؛ چوێلەکە ▪ گنجشک

**کێژوله / kêjûle/**: ناو. چۆلەکە؛ چوێلەکە 🇮🇷 گنجشک

**کێس**[١] **/ kês/**: ناو. ١. ☜ کیس ٢. کەس؛ مرۆ 🇮🇷 ١. ☜ کیس ٢. کس؛ شخص

⊡ **کێس لێ هێنان:** دەرفەت هێنان 🇮🇷 فرصت یافتن

**کێس کردن:** ☜ کیس کردن

**کێس هانین:** دەرفەت دەس کەوتن 🇮🇷 فرصت یافتن

**کێس**[٢]: ئاوەڵناو. لەبار؛ شیاو 🇮🇷 مُناسب

**کێستەک**[١] **/ kêstek/**: ناو. کەستەک؛ کلۆ 🇮🇷 کلوخ

**کێستەک**[٢]: ئاوەڵناو. [کنایە] ئازا؛ بوێر 🇮🇷 شُجاع

**کێستەنە / kêstene/**: چاوگ. مرۆ کوشتن 🇮🇷 آدم کشتن

**کێسم / kêsim/**: ناو. تەحر؛ تەرح؛ بیچم؛ کەسم 🇮🇷 شکل؛ قیافه

**کێسمە / kêsme/**: ناو. باجێک ئاغا دەیسێنێ 🇮🇷 باجی که مالک می‌گیرد

**کێسو / kêsû/**: ☜ کیسەڵ

**کێسین / kêsîn/**: ناو. لوولە؛ لیلە؛ زرِندی 🇮🇷 لوله

**کێش**[١] **/ kêş/**: ناو. ١. کەژ؛ ساو ‹بچۆ دوو گەز کێشی پان بستێنە!› ٢. قورسایی؛ سەنگینی ‹کێشی چوار کیلۆ بوو› ٣. پێز؛ ڤەکێشی ‹هەویرەکە کێشی چۆنە؟› ٤. ڕاکێش؛ ڕاکشی ‹کێشی نەماوە، ڕەویوەتەوە› ٥. تاقەت؛ توان؛ تابشت ‹چیتر کێشم نییە، با دانیشم!› ٦. ئەسپایی جووت؛ نیر و ئاموور ٧. سەروێنی هەورێشمی ڕەش ‹سەفوەتی سۆفی لە شانە و ڕیشدا دەرناکەوێ/ نووری دەروێشی لە پرچ و ڕەشتی و کێشا نییە «ناری»› ٨. هەڤدەن؛ وەزن؛ ڕەوتی هەڵبەست ‹کێشی برگەیی، کێشی عەرووزی› ٩. گونجەی دارینی ئەستێر 🇮🇷 ١. کِش ٢. وزن ٣. کشداری ۴. کشش ۵. تاب و توان ۶ خیش ۷. دستار ابریشمی مشکی ٨. وزن شعر ٩. دریچەی چوبی استخر

⊡ **کێش دان:** [کنایە] درێژە پێ دان ‹قسەکەی زۆر کێش دا، خەڵکەکە ماندوو بوون› 🇮🇷 کِش دادن

**کێش کردن/ کرن:** ڕاکێشان؛ کشاندن 🇮🇷 کشیدن

**کێش هاتن:** کێشیان؛ لە دوو هاتن ‹هەویرەکە کێشی نایە› 🇮🇷 کِش آمدن

**کێش هاوردن:** کێشان: ١. ڕاکێشان ٢. درێژە پێ دان 🇮🇷 ١. کِش دادن ٢. ادامه دادن

• **کێش**[٢]: پاشەوشە. ١. چێژەر؛ کێشی ‹ئازارکێش؛ زەحمەتکێش› ٢. ـ ڕاکێش؛ ڕاکێشەر ‹گوریس‌کێش؛ دارکێش› ٣. ڕاگوێز ‹بەردکێش؛ قوڕکێش› ٤. مژ لێدەر ‹جگەرەکێش؛ قلیان‌کێش› ٥. قورسایی لێکدەر ‹ترازووی زێڕکێش› ٦. ڕاماڵ ‹ماڵەکێش› ٧. ڕاهێن ‹جۆکێش› ٨. لێدەر ‹چەقۆکێش؛ شیرکێش› ٩. ـگەر؛ هەڵگر ‹وێنەکێش› 🇮🇷 ١و٢. ـکِش ٣. ـبر؛ ـکش ۴تا۷. ـکش ٨. ـ زن ٩. ـگر

**کێشان / kêşan/**: چاوگ. تێپەڕ. //کێشات؛ دەکێشی؛ بکێشە// ١. بەراورد کردنی قورسایی بە تەرازوو ‹میوە کێشان› ٢. ڕاکێشان ‹گوریس کێشان› ٣. ڕاگواستن؛ گۆزانەوە ‹بار کێشان› ٤. مژ لە دووکەڵ دان ‹جگەرە کێشان› ٥. کوێرەوەری دیتن ‹شەو دەکێشم شەونخوونی و بێخەوی/ ڕۆژ دەچێژم دەرد و داخی بێئەوی هێمن»› ٦. لە جێی خۆ دەرهێنان ‹ددان کێشان؛ شیر کێشان› ٧. یەکسمی مێ لە نێر چاکردن ٨. هەڵگرتنی وێنە بە دووربین/ کامێرا ‹وێنە کێشان› ٩. دانانی نەخش بە قەڵەم ‹نەخش کێشان› ١٠. دروست کردنی شتێک لە یەک ڕاستەدا ‹جادە کێشان› ١١. لێدان و پێدا خشان ‹خۆی کێشا بە درگاکەدا› ١٢. تێوەدان ‹وڵاتیان کێشاوەتە گەندەڵی› ١٣. بەردان ‹هەسێڵەکەم کێشا› 🇮🇷 ١. وزن کردن ٢. کشیدن ٣. جابجا کردن ۴. پُک زدن ۵. تحمل کردن سختی ۶ کشیدن؛ درآوردن ۷. مادینه را به گشن

نشـان دادن ٨. عکـس گـرفتن ٩. تصـویر کشـیدن ١٠تا١٢. کشیدن ١٣. باز کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەکێشان

**کێشاندن** / kêşandin/: چاوگ. تێـپەر. //کێشـاندت؛ دەکێشێنی؛ بکێشێنە// کێشانن؛ گەیاندن بە ئاکـام یان پێشـهاتێک ‹کارەکـەیان کێشـاندە ئێـوارە› ☰ کشاندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەکێشاندن

**کێشانکار** / kêşankar/: ناو. نیگارڤـان؛ وێنـەکێش؛ نەققاش ☰ نقاش

**کێشانن** / kêşanin/: ☜ **کێشاندن**

**کێشانە** / kêşane/: ناو. کاری بە تەرازوو کێشان ☰ توزین

▣ **کێشانە کردن**: هەڵسەنگاندنی کێشـی شـتێ ☰ وزن کردن

**کێشانەوە** / kêşanewe/: چاوگ. تێـپەر. //کێشـاتەوە؛ دەکێشییەوە؛ بکێشەوە// ١. کشاندنەوە ٢. دەرهێنان لە پـاش تێـڕاکردن ٣. دیسـانەوە هەڵسـەنگاندنی کێشی شتێ ☰ ١. بە عقب کشیدن ٢. بیرون کشیدن پس از فرو کردن ٣. دوباره وزن کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەکێشانەوە

**کێشای** / kêşay/: چاوگ. کێشان ‹نەسیم پەنجـەی پـات ئـەر سـەردی کێشـان/ بـدارەش نـە تـۆی دڵ دەروون ڕێشان «مەولەوی»› ☰ کشیدن

**کێشتانە** / kêştane/: ناو. شاگردانە ☰ انعام

**کێشتش** / kêştiş/: چاوگ. کوژران ☰ کشته شدن

**کێشتکۆنی** / kêştkonî/: نـاو. کشـتکانی؛ لابـەلا؛ تلاوتل ☰ یکوری

**کێشتە** / kêşte/: ☜ **کوژراو**

**کێشتەی** / kêştey/: چاوگ. کێشان ☰ کشیدن

**کێشدار** / kêşdar/: ئاوەڵـناو. ١. چێـڕ؛ لـە پـسـان بەدوور ٢. *[مەجاز]* زۆرخایەن ☰ ١. کشدار ٢. وقتگیر

**کێشران** / kêşran/: چاوگ. تێنەپەر. نادیار. //کێشـرای؛ دەکێشرێی؛ بکێشرێ// کێشیان: ١. بەراورد کرانی قورسایی بە ترازوو ٢. مێ لە نێر چاک کـردن ٣. ڕاکێشران؛ بە سەر زەویدا کێشان ☰ ١. وزن شدن ٢. گشن دادن مادینە ٣. کشیده شدن بر زمین

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: کێشـراو/ چاوگی نـەرێنی: نەکێشران

**تێبـینی**: زۆربـەی ئـەو مانایانـە لـە چـاوگی «**کێشان**»دا ئاماژەی پێکراوە، لێرەش بە شـێوەی نادیـار (مجهـول) دەگـوترێ. هـەروەها لـە ئاوەڵناوەکەشی (**کێشراو**)دا:

**کێشراو** / kêşraw/: ئاوەڵناو. کشاو؛ کێشیاگ: ١. بە تەرازوو بـەراوردکراو ٢. دەرهـاتوو لـە کـالان ٣. ڕاکێشراو بە سەر زەویـدا ٤. مژلێـدراو ☰ ١. وزن شدە ٢. آختە ٣. بر زمین کشیدە شدە ۴. پُک زدە شدە

**کێشک** / kêşik/: ناو. ١. کاری کشان بە زەویـدا ٢. ئێشک؛ پاس ٣. قورسایی لەش لـە بـەر تـا ☰ ١. عمل کشیدە شدن بر زمـین ٢. نگهبـانی ٣. سـنگینی تن از تب

▣ **کێشک گرتن**: پاسەوانی کردن ☰ پاسداری کردن

**کێشک کێشان**: پاسداری کردن ☰ نگهبانی دادن

**کێشکچی** / kêşikçî/: ناو. پاسەوان ☰ پاسبان

**کێشکە** / kêşke/: ناو. چۆلەکە؛ چێشکە؛ پاساری ☰ گنجشک

**کێشماکێش** / kêşmakêş/: ☜ **کەشمەکەش**

**کێشندە** / kêşinde/: ☜ **کێشەر**

**کێشنە** / kêşne/: ئاوەڵـناو. ڕاکێشـەر؛ کێشـەر ☰ جاذب

**کێشنەی** / kêşney/: چاوگ. کێشاندن ☰ کشاندن

**کێشوەلە** / kêşwele/: ☜ **کێشولە**

**کێشولە** / kêşûle/: نـاو. کێشـوەلە؛ چۆلەکـە؛ کێشکە؛ چڤیک ☰ گنجشک

**کێشە** / kêşe/: ناو. ١. کاری وەک بـردنی کلـۆش بۆ سەر خۆیان و ... ٢. شـەڕ؛ داوا ٣. دەمەقاڵـە؛

شەڕەقسە ٤. کاری ژێر خاک کردنی لکی داری وەک ڕەز، بەبێ ئەوە کە ببپڕن ٥. جۆرێ سەرپۆشی ژنانە ٦. داری ناو هلۆڵ بۆ پێداهاتنی ئاوی ئەستێر ☰ ١. عمل مانند کشیدن غلەی درویده به سر خرمن و ... ٢. نزاع؛ جنگ ٣. نزاع لفظی ۴. عمل خواباندن شاخەی گیاه، مانند مو، بدون برش ۵. نوعی سرپوش زنانه ۶. کُندەی توخالی در دهانەی استخر برای تخلیەی آب

**کێشەدار** / kêşedar/: ئاوەڵناو. گێچەڵی؛ گەڕتێئاڵاو ☰ مُشکلدار

**کێشەر** / kêşer/: ئاوەڵناو. کێشندە؛ بەرەو خۆ ڕاکێش ☰ کِشندە؛ جاذب

**کێشەکەر** / kêşeker/: ئاوەڵناو. بیانووگر؛ بەهانەگیر؛ بیانک‌گیر ☰ بهانەجو؛ بهانەگیر

**کێشەکێش**[1] / kêşekêş/: ناو. شەڕ و هەرا ☰ نزاع و اختلاف

**کێشەکێش**[2]: ئاوەڵکار. ١. خێشەخێش؛ لە باری ڕاکێشاندا ‹کێشەکێش دوو گوێنی گەورەی ئاردی هێنا› ٢. بە زۆر و نابەدڵی ‹کێشەکێش بردیان بۆ زەماوەن› ☰ ١و٢. کشان ـکشان

**کێشەن** / kêşen/: ناو. کاری کێشان بە قەڵەم ☰ نقاشی

**کێشەوبەرە** / kêşe w bere/: ناو. کەشمەکەش ☰ کشمکش

**کێشەوگێرە** / kêşe w gêre/: ناو. ١. جەنگەی خەرمان کوتان ٢. کێشەوبەرە ٣. کێشەوهەرا؛ زەحمەت و دەردیسەری ☰ ١. موسم خرمن‌کوبی ٢. کشمکش ٣. رنج و زحمت

**کێشەوە** / kêşewe/: ناو. کێشەوێ؛ گوازتنەوە بە کۆمەڵ ☰ جابجا کردن گروهی

**کێشەوهەرا** / kêşe w hera/: ☜ **کێشەوگێرە ـ٣**

**کێشەوێ** / kêşewê/: ☜ **کێشەوە**

**کێشەهەڵایسێن** / kêşehelaysên/: ئاوەڵناو. پشێوێنە؛ ئاژاوەچی؛ مایەفیتنە؛ کتکەنەفتینە؛ سەرەسۆدرە ☰ فتنەانگیز

**کێشیاگ** / kêşyag/: ☜ **کێشراو**

**کێشیان** / kêşyan/: چاوگ. ١. ☜ **کێش هاتن** ٢. ☜ **کێشران**

**کێشیای** / kêşyay/: چاوگ. کێشران ☰ کشیده شدن

**کێف** / kêf/: ناو. ١. ☜ **کێو** ٢. ئەشکەوت ٣. ☜ **کەیف** ☰ ١. ☜ **کێو** ٢. غار ٣. ☜ **کەیف**

◘ **کێف کردن**: ☜ **کەیف کردن**

**کێفرۆشک** / kêfruşk/: ☜ **کەروێشك**

**کێفرۆشک** / kêfroşk/: ☜ **کەروێشك**

**کێفژاڵ** / kêfjał/: ☜ **قرژانگ**

**کێفسار** / kêfsar/: ناو. کۆسار؛ ناو چیا ☰ کوهسار

**کێفساران** / kêfsaran/: ناو. کوێستان؛ کوێسان ☰ کوهستان

**کێفسان** / kêfsan/: ☜ **کوێستان**

**کێفسانی** / kêfsanî/: ئاوەڵناو. شاخاوی؛ کوێستانی ☰ کوهستانی

**کێفکی** / kêfkî/: ئاوەڵناو. گەنیو؛ بۆگەن بوو ☰ گندیده

**کێفەرات** / kêferat/: ناو. خەباتی سەخت؛ بەربەرەکانێ وێڕای زەحمەتی زۆر ☰ مُبارزەی سخت

**کێفی** / kêfî/: ☜ **کێوی**

**کێفیلە** / kêfîle/: ☜ **کێویلە**

**کێڤ** / kêv/: ☜ **کێو**

**کێڤانی** / kêvanî/: ☜ **کابان**

**کێڤانیە** / kêvan(i)ye/: ☜ **کابان**

**کێڤرویشک** / kêvruyşk/: ☜ **کەروێشك**

**کێڤی**[1] / kêvî/: ناو. ژێرپیاڵەی سواڵەت (جێ کەرە و هەنگوین لە سەر سفرە) ☰ نعلبکی سفالین

**کێڤی**[2]: ☜ **کێوی**

**کێک** / kêk/: ناو. ١. کەیک ٢. کادە؛ کولووچە ☰

١. کیک ٢. کلوچه

**کێکف / kêkif/:** ☜ **کەیکف**

**کێکنجی / kêkincî/:** ☜ **کاکنج**

**کێکۆ / kêko/:** ☜ **کەیکف**

**کێکە / kêke/:** ناو. پێوەرە؛ پێوانە ☳ پیمانه

**کێکەمتر / kêkemtir/:** ناو. کەمبەرکێ؛ جۆرێ کڕین کە فرۆشیاران بانگهێشت دەکرێن، کێ هەرزانتری بدا، لەوی دەستێنن ☳ مُناقصه

**کێل[1] / kêl/:** ناو. ١. بەردی سەرین و خوارینی قەبر ‹بنووسن لە سەر کێلی مەزارم/ شەهیدی عەشقم، مەدەن ئازارم «فولکلۆر»› ٢. هەر جۆرە بەردی بە پێوە ڕاوەستێنراو ٣. سەرداری عێل ٤. دروومان؛ کاری دوورین ٥. نیشانەی کەوشن ٦. پێوانەی دانەوێڵە ٧. سابرێن؛ تەگە ٨. جۆرێ کولێرە کە لە بن ژێلەمۆ دەبرژێ ٩. پەپکە؛ پاپۆکەی مار ☳ ١. سنگ مزار ٢. سنگ نصب شده به حالت ایستاده ٣. بزرگ ایل ۴. دوخت ۵. علامت مرزی ۶. پیمانەی غله ٧. شاک؛ بُز نر ٨. نوعی نان گرده ٩. چنبرەی مار

⊡ **کێل بوونەوە:** هەستانە سەر پێ ☳ پا شدن و ایستادن

**کێل دان:** ١. دادروون؛ دروون ٢. بەرەو ژوور ئاویتن ☳ ١. دوختن ٢. به بالا پرتاب کردن

**کێل هەدان:** بەرەوژوور ئاویتن؛ کێل دان ☳ به بالا پرتاب کردن

**کێل[2]:** ئاوەڵناو. ١. بلند؛ بەرز ‹کێل گەردن› ٢. جوانچاکی بالابلند ☳ ١. بلند ٢. رعنا

⊡ **کێل کردن:** بلند کردن ☳ بلند کردن

**کێلان / kêlan/:** ☜ **کالان[2]ـ١**

**کێلانە / kêlane/:** ☜ **کالانە**

**کێلانێ / kêlanê/:** ناو. کێبەرکێ لە ئامانج پێکاندا ☳ مسابقەی تیراندازی

**کێلب / kêlb/:** ☜ **کلبـ١**

**کێلبۆ / kêlbo/:** ئاوەڵناو. کەڵپدرێژ ☳ دندان‌دراز

**کێلبە / kêlbe/:** ناو. ١. ددانی پێشەوەی حەیوان ٢. کەڵپە شاخ ٣. گوڵوێنە؛ چاوگی تەندوور ☳ ١. دندان پیشین حیوان ٢. دماغەی کوه ٣. بادکش تنور

**کێلپەنی / kêlpenî/:** ناو. *[مەجاز]* سەگبیەتی؛ فێڵبازی و درۆزنی ☳ شیطنت

**کێلستون / kêlistûn/:** ☜ **کۆلکەزێرینە**

**کێلک / kêlik/:** ناو. ١. ئامانج بۆ تیر و بەرەقانی ٢. کێل؛ نیشانی سەر سنوور ☳ ١. آماج؛ هدف ٢. علامت مرزی

**کێلکن / kêlkin/:** ناو. چۆنیەتی کۆ بوونەوەی ئاپۆرە بە جەغز لە دەوری شتێک ☳ چگونگی حلقه زدن مردم دور چیزی

**کێلکەوانە / kêlkewane/:** ☜ **کلکەوانەـ٢**

**کێلکی / kêlkî/:** ناو. گلێنەی چاو؛ گلارەی چەم ☳ مردُمک چشم

**کێلکیکوڕ / kêlkîkuř/:** ئاوەڵناو. بێچاو؛ کوێر ☳ نابینا

**کێلگەردن / kêlgerdin/:** ناو. گەردنی بەرز و ناسک و جوان ☳ گردن بلند زیبا

**کێلنجی / kêlincî/:** ناو. سیخوڕمە؛ مستەکۆڵە ☳ سُقلمه

**کێلوانە / kêlwane/:** ناو. پاسارە؛ سوانە؛ سەرسوانە ☳ لبەی بام

**کێلوبەرد / kêl û berd/:** ناو. کایەی دوو دەستەیی بە شێوەی پەڵ خستن بۆ چەند کێلی بەرانبەر ☳ نوعی بازی با سنگ

**کێلوک / kêluk/:** ناو. کێلێک؛ ژنێ کە لە سەر ئاینی ئیسلام نەبێ ☳ زن غیرمسلمان

**کێلودە / kêlûde/:** ناو. قاپیلک؛ توێکڵ ☳ پوسته

**کێلوکە / kêlûke/:** ناو. داهۆڵ؛ ئەو گەنمەی لە دوای دروێنە بە پێوە دەمێنێتەوە ☳ شاخەی گندم برجا مانده از درو

**کێلون / kêlûn/:** ☜ **کێلۆن**

**کێله** / kêle/: ناو. ١. کیلەی دەخڵ پێوان ٢. تەپاڵە کێویلە ☰ ١. پیمانەی غله ٢. تاپالەی دشت

**کێلەبەردانێ** / kêleberdanê/: ناو. کاری بەرد هاویشتن بۆ ئامانج ☰ نشانەگیری با سنگ

**کێلەبەردینە** / kêleberdîne/: ناو. یارییەکی منداڵانە ☰ از بازی‌های کودکانە

**کێلەڕێ** / kêleřê/: ناو. تابلۆ و نیشانەی قەراخ ڕێ ☰ علائم کنار جادە

**کێلەک** / kêlek/: ناو. ١. تەنیشت؛ پاڵ ٢. تەقەڵ؛ بەخیە ٣. جۆرێ نانی چکۆڵە بۆ زارۆکان ☰ ١. پهلو ٢. بخیە ٣. نوعی نان

▣ **کێلەک دان**: کلا بوون؛ لادان لە ڕێ ☰ مُنحرف شدن

**کێلەکە** / kêleke/: ناو. کالەکە؛ کورتەکەلەکە؛ کەلەکە؛ کێلەکێ؛ خاڵیگە؛ برک ☰ تُهیگاه

**کێلەکێ** / kêlekê/: ☜ **کێلەکە**

**کێلەندی** / kêlendî/: ☜ **کەرەنتو**

**کێلی** / kêlî/: ناو. دەم و کات ☰ وقت؛ هنگام

**کێلێژە** / kêlêje/: ناو. ١. چەلاک؛ ئەستوندەکی باریکی درێژ بۆ چادر و کەپر ٢. داری ئەولاولای لاشیپانە ☰ ١. ستون باریک خیمە و کازە ٢. چوب‌های کناری درب

**کێلێک**[1] / kêlêk/: ☜ **کێلوک**

**کێلێک**[2]: ئاوەڵکار. تاو؛ دەمووکە ☰ لحظە؛ زمان کوتاه

**کێڵ**[1] / kêł/: ناو. ١. ☜ **کەوێڵ ـ١** ٢. چارداغ؛ کەوێڵی ناو بێستان و مەزرا ٣. نەخشی بەڕە ٤. کێلی قەبر ٥. جووتوشۆ ☰ ١. ☜ **کەوێڵ ـ١** ٢. گازە ٣. نقش گلیم ۴. سنگ قبر ۵. کشت و شخم

▪ **کێڵ**[2]: پاشەوشە. بکێڵ؛ وەردەدەرەوە ‹ڕەقەنکێڵ؛ گاکێڵ› ☰ شخم‌زن

**کێڵان** / kêłan/: چاوگ. تێپەڕ. //کێلات؛ دەکێلێ؛ بکێلە// شۆ بڕینی زەوی ☰ شخم زدن زمین

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەکێلان

**کێڵاو** / kêław/: ☜ **کێڵراو**

**کێڵدران** / kêłd(i)ran/: ☜ **کێڵران**

**کێڵدراو** / kêłd(i)raw/: ☜ **کێڵراو**

**کێڵران** / kêłran/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //کێلرای؛ دەکێلرێ؛ بکێلرێ// کێڵدران؛ کێڵیان؛ شێو کران؛ جووت لێ کران ☰ شخم زدە شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: کێلراو/ چاوگی نەرێنی: نەکێلران

**کێڵراو** / kêłraw/: ئاوەڵناو. کێلاو؛ کێلدراو؛ شێوکراو ☰ شخم‌زدە

**کێڕان** / kêřan/: چاوگ. خەورین؛ کالیای؛ کێلڕان (زەوی و ...) ☰ کاشتە شدن

**کێڵگە** / kêłge/: ناو. ١. زەوی و زار؛ مەزرا؛ مووچە؛ شوێنی کشتوکاڵ ٢. بکێڵە؛ زەمینێ کە شێو دەکرێ ٣. [مەجاز] شوێنی چاندن و ڕاگرتنی شتێک بۆ هەڵێنجان و وەرگرتنی بەرهەم و بەهرە ‹کێڵگەی نەوتی؛ کێڵگەی ماسی› ☰ ١. مزرعە ٢. زمینی کە شخم زدە می‌شود ٣. مزرعە

**کێڵیاگ** / kêłyag/: ناو. چاندراو ☰ کاشتە

**کێڵیان** / kêłyan/: ☜ **کێڵران**

**کێم**[1] / kêm/: ناو. زووخ؛ زووخاو؛ زەرداوی برین ☰ ریم؛ خونابەی زخم

▣ **کێم کرن**: زووخ لە برین هاتن ☰ چرک و خونابە از زخم تراوش کردن

**کێم**[2]: ئاوەڵناو. کم؛ کەم؛ کێم ☰ اندک

▣ **کێم کرن**: کەم کردنی شتی زۆر ☰ کاستن

**کێم هاتن**: ١. لە بەراوردا بە هەڵە چوون ٢. لە کێشانەوە بە تەرازوو کەم هێنان ☰ ١. کم آمدن ٢. کم وزن کردن در توزین

**کێماتی** / kêmatî/: ☜ **کەمایەسی**

**کێماسی** / kêmasî/: ☜ **کەمایەسی**

**کێمانی** / kêmanî/: ناو. ١. کەمایەتی؛ کەموکووڕی ٢. کیفی جێ پارەی باخەڵ ٣. بەریک؛ گیرفان

🇮🇷 ١. کاستی ٢. کیف پول ٣. جیب

**کێماهی** / kêmahî/: ناو. ١. کەمتەرخەمی؛ کەترەخەمی ٢. کەمایەتی؛ کەمایەسی 🇮🇷 ١. کوتاهی در کار ٢. کاستی

**کێمایی** / kêmayî/: ☜ **کەمایەسی**

**کێمباک** / kêmbak/: ئاوەڵناو. بێپەروا؛ چاونەترس 🇮🇷 بی‌پروا

**کێمبڕ** / kêmbiř/: ئاوەڵناو. کەمڕیژەو (زەمین) 🇮🇷 کم‌حاصل

**کێمبەر** / kêmber/: ئاوەڵناو. کەممیوە (باخ) 🇮🇷 کم‌حاصل

**کێمخوا** / kêmx(i)wa/: ☜ **کیمخوا**

**کێمخۆر** / kêmxor/: ☜ **کەمخۆر**

**کێمژمێر** / kêmj(i)mêr/: ئاوەڵناو. بێئەقڵ؛ بێئاوەز 🇮🇷 کم‌عقل

**کێم ـ کێم** / kêm kêm/: ☜ **کەم ـ کەم**

**کێمکێمە** / kêmkême/: ☜ **کەم ـ کەم**

**کێموکوڕی** / kêm û kûřî/: ☜ **کەموکوڕی**

**کێمەش** / kêmeş/: ناو. خەرامان؛ کار و ڕەوتی ڕۆیشتنی زۆر لەسەرخۆ 🇮🇷 خرام؛ عمل بسیار آهسته راه رفتن

**کێمەشک** / kêmeşk/: ناو. بەرمەمشکە؛ بەرمەشکە 🇮🇷 کره‌ی یکبار مشک زدن

**کێمی** / kêmî/: ناو. کەمی؛ نوقوستانی؛ کەموکووڕی 🇮🇷 کمی؛ کاستی

**کێمیڤە** / kêmîve/: ئاوەڵکار. لانی کەم؛ هیچ نەبێ 🇮🇷 اقلاً؛ حداقل

**کێن**[١] / kên/: ☜ **کوێن**

**کێن**[٢]: ئاوەڵکار. کوێ؛ کۆ 🇮🇷 کُجا

**کێن**[٣]: جێناو. کێ؛ کێهە 🇮🇷 چه کسی

**کێنا** / kêna/: ناو. کیژ؛ کچ؛ کەنیشک 🇮🇷 دختر

**کێنات** / kênat/: ☜ **کالان**[٢]

**کێنج** / kênc/: ناو. گیرۆیی؛ ڕەوتی گرتنەوەی نەخۆشی 🇮🇷 واگیری؛ سرایت بیماری

**کێندەرێ** / kênderê/: ئاوەڵکار. کانجا؛ کوێ؛ کۆ 🇮🇷 کجا

**کێنو** / kênû/: ئاوەڵناو. ڕکوونی؛ بوغز لە زگ 🇮🇷 کینه‌توز

**کێنی** / kênî/: ☜ **کانی**[١]**ـ١**

**کێو** / kêw/: ناو. کێف؛ کێڤ؛ چیا؛ کەژ؛ کۆ 🇮🇷 کوه

**کێوات** / kêwat/: ناو. ناو چیا؛ کۆساران 🇮🇷 کوهساران

**کێوان** / kêwan/: ناو. زۆزان؛ سەلان؛ زەوزان 🇮🇷 کوهستان

**کێور** / kêwir/: ☜ **کاهو**

**کێوژ** / kêwij/: ☜ **کەویژ**

**کێوسار** / kêwsar/: ☜ **کوێستان ـ٢**

**کێوسان** / kêwsan/: ☜ **کوێستان**

**کێوستان** / kêwistan/: ☜ **کوێستان**

**کێوڵان** / kêwłan/: ☜ **کوێستان ـ٢**

**کێوماڵ** / kêwmał/: ناو. کاری بە کۆمەڵ گەڕان لە کێو، بە دووی شتێکدا 🇮🇷 جستجوی گروهی در کوه ◻ **کێوماڵ کردن**: کێو دانە پەی ‹کێوماڵمان کرد ڕێویمان پەیدا نەکرد› 🇮🇷 کوه را گشتن

**کێوەلی** / kêwelî/: ☜ **کاولی**

**کێوی** / kêwî/: ئاوەڵناو. کاڤی؛ کێفی؛ کێڤی؛ کۆڤی: ١. سەر بە کێو ‹گوڵی کێوی؛ گیانداری کێوی› ٢. *[پلار]* دەشتەکی؛ کێفیلە؛ کێویلە؛ بێوەری لە ژیار و فەرهەنگ ‹کابرای کێوی هەروا ملی لێ ناوە!› 🇮🇷 ١. کوهی ٢. وحشی

**کێویلکە** / kêwîlke/: ☜ **کێویلە**

**کێویلە**[١] / kêwîle/: ناو. کێویلکە؛ تەپاڵەی دەشتی 🇮🇷 تاپاله‌ی دشت

**کێویلە**[٢]: ئاوەڵناو. کێفیلە؛ کێویلکە؛ دەشتەکی 🇮🇷 وحشی

**کێهە** / kêhe/: جێناو. کامە؛ کام 🇮🇷 کدام

# گ

**گ** / g/: پیت. نیشانەی بیست و سێیەمین پیتی ئەلفوبێی زمانی کوردی ≡ گ؛ نشانەی بیست‌وسومین حرف الفبای زبان کُردی

**گ**[1] / gi/: ناو. ١. بیست‌وسێیەمین پیتی ئەلفوبێی زمانی کوردی ٢. ☜ **گوــ١** ≡ ١. گ؛ بیست و سومین حرف الفبای زبان کُردی ٢. ☜ **گوــ١**

**گ**[2]: ئاوەڵناو. *[سوورکەڵە]* گشت؛ هەموو ‹گ سالێ؛ گ کەسێ› ≡ همه

**گ**[3]: ئامراز. ک؛ کوو ≡ که

**ـ گ** / ig-/: پاشگر. ١. ـ وو؛ بە دوای ڕەگی کار (ڕابردوو)ەوە دەلکێ، ئاوەڵناوی بەرکار دروست دەکا ‹مردگ؛ مانگ؛ کەفتگ› ٢. ـگا؛ شوێن ‹ئاورگ› ≡ ١. پسوندِ صفتِ مفعولی ساز ٢. ـ دان

**گا**[1] / ga/: ناو. ١. گاو؛ گۆ؛ گاوە؛ چوارپەلێکی گەورەی دەستەمۆیە، بۆ کار و گۆشت و پێستەکەی بەخێو دەکرێ ٢. *[کینایە]* مرۆی زۆرخۆر ≡ ١. گاو نر ٢. انسان پرخور

▣ **گای بازگ:** ڕیوە؛ گای بەڵەک ≡ گاو ابلق

**گای بنە:** ☜ **گابنە**

**گای بەش:** *[پلار]* گای مارۆ ‹لە مابەینی کلاوسوور و کلاوڕەش/ پەرێشان و دیارن میسلی گای بەش «حاجی قادر»› ≡ گاو پیشانی سفید

**گای بێگاوان:** *[پلار]* وێڵ و بێ‌کار؛ بێ‌خاوەن ≡ علاف

**گای دمۆن:** ☜ **گای مارۆ**

**گای قەرەبەگی:** ☜ **گای مارۆ**

**گای قەش:** ☜ **گای مارۆ**

**گای قەشقە:** ☜ **گای مارۆ**

**گای مارۆ:** گای دمۆر؛ گای قەرەبەگی؛ گای قەش؛ گای بەش؛ گای قەشقە: ١. گای نێوچاوان سپی کە لە دوورەوە دیارە ٢. *[پلار]* سیمڕۆ؛ مرۆڤی ناسراوی نامـاقووڵ ≡ ١و٢. گاو پیشانی سفید

**گای ناو گوێرەگەل:** *[پلار]* زل و زەبەلاح، لە چاو دەوروبەر و هەوالان ≡ گُندە و بی‌قوارە نسبت به اطرافیان

**گای یەک ئاخوڕ:** *[پلار]* هاوکاسە ≡ هم‌پالکی

**گایێ ستوونێ:** گای بارەبەر ≡ گاو بارکش

▣ **گا دان:** ١. *[شوورەیی]* لە کەڵ کێشانی چێڵ ٢. قازانج کردن لە مامڵەدا ≡ ١. گشن دادن گاو ماده ٢. سود بردن در معامله

**هاتنە گا:** ئامادەی کێڵران بوونی زەوی ئاوەنیا ≡ آمادەی شخم شدن زمین کشاورزی

**گا**[2]: ئاوەڵکار. جار؛ کەڕەت؛ چەل ‹گا دەسووتێم گا دەگرێێم غەرقی ئاو و ئاگرم/ ئاخ لە بەر بەختی سیا نازانم ئەز بۆچ نامرم؟ «وەفایی»› ≡ گاه

**گا ـ**[٢]: پێشگر. زل؛ گەورە؛ قەبە ‹گابەرد؛ گاپا؛ گاچاڵ› ☰ گُندە؛ بزرگ

**ـ گا**[٤]: پاشگر. ١. ـگـە؛ جـێ؛ شـوێن ‹زانسـتگا؛ لەوەڕگا› ٢. کات ‹سەحەرگا› ☰ ١و٢. ـ گاه

**• گا**[٥]: پاشەوشە. *[ناشیرین]* ـگاو؛ گاییو؛ گایاو؛ گایـاگ ‹شەکی شوانان گا؛ کەران باب گا› ☰ گاییده

**گائاسایی / ga'asayî/**: ☜ **گاوەکی**

**گائەل / ga'el/**: ☜ **گاگەل**

**گائەنگێو / ga'engêw/**: ناو. جۆرێ ماری باریـک و کەوە ☰ نوعی مار

**گابـار / gabar/**: نـاو. گـاوار؛ کاروانـێ کـە چـێڵ و گایان بـار کـردووە ☰ کـاروانی کـە بـار بـر گـاوان نهادەاند

**گابارە / gabare/**: ناو. شکێڕ؛ قەڵشەشاخ ☰ شکاف در صخرەی کوه

**گابرە / gab(i)ře/**: ناو. گیایەکە وەک زەل لـە نـاو تالاوا دەڕوێ ☰ گیاهی مُردابی

**گابنە / gab(i)ne/**: ناو. گابنەوەر؛ گاوابنە؛ گای بنە؛ ئەو گایە کە دەکەوێتە ناوەڕاسـتی گێـرەوە و لـە دەوری خۆی دەسووڕێ ☰ گاو بنە در خرمنکوبی

**گابنەوەر / gab(i)newer/**: ☜ **گابنە**

**گابنێزک / gab(i)nêzk/**: ☜ **گابنێسك**

**گابنێزکی / gb(i)nêzkî/**: ☜ **گابنێسك**

**گابنێسک / gab(i)nêsk/**: نـاو. گابنێزک؛ گابنێزکی؛ گاوەناز؛ گەبە؛ گوێڕەپەی گـا؛ نەخۆشـییەکە لـە ئەستۆی گا پەیا دەبێ ☰ بیماری نکاف گاو

**گابۆڕ / gabor̄/**: ناو. گاقۆڕ: ١. شین و قێڕ و هۆڕی گایەل کە خوێنی گای سەربڕاو دەبینن ٢. *[پەلار]* شین و گریانی بە دەنگی بەرز ٣. جۆرێ جۆلانـە ☰ ١. صدای بە هم آمیختـەی گاوهـا هنگـام دیـدن خون گاو ذبح شده ٢. شیون و هوار ٣. نوعی تاب

**گابـەرد / gaberd/**: نـاو. گاکوچـک؛ تەلەسـەنگ؛ بەردی زل ☰ خرسنگ

**گابـەگـایی / gabegayî/**: ئاوەڵـکار. گـە ـ گانـە؛ جاروبارە ☰ گاەگاه

**گابەڵەک / gabełek/**: نـاو. گابەڵـەکە: ١. خێزانـە باڵندەیەک لە تۆرەمـەی ڕەشیشـە، بـریتین لـە: گابەڵەکە، بـاڵبەڵـەک و گابەڵـەکە ڕێ ـ ڕێ ٢. باڵندەیەکە لە کۆتر بچووکتر، سەر و ملی ڕەش و تۆقی ملی سپی و خەتێکی سپی بە باڵیدا کشاوە، پشـت و پاشەڵـی بـۆر دەنوێنـێ و کلکـی ڕەش، سینگی مەیلەو زەرد و ژێر پاشەڵی زەردی تۆخە. لـە زەل و زۆنـگ و نێـو پنچـک و زەوی و زاران دەژی ☰ ١و٢. چک

**گابەڵەکە / gabełeke/**: ☜ **گابەڵەك**

**گـاپ / gap/**: نـاو. زبـارە؛ گـەل؛ هـەرەوەز ☰ کـار تعاونی

**گاپـا / gapa/**: ئاوەڵـناو. *[پەلار]* گاپـێ: ١. پـازل؛ خـاوەن پـای گـەورە ٢. تـەپ؛ تەمـەڵ لـە ڕێ ڕۆیشتن ☰ ١. پاگُندە ٢. تنبل در راه رفتن

**گاپـاوس / gapawis/**: ئاوەڵـناو. *[پەلار]* تەمـەڵ؛ تەمبەڵ ☰ تنبل

**گاپل / gapil/**: ناو. کۆترەگایە ☰ کبوتر جنگلی

**گاپلوک / gap(i)lûk/**: ناو. گیایەکە ☰ گیاهی است

**گاپڵ / gapił/**: ☜ **گاپێڵ**

**گاپوش / gapûş/**: ناو. وردەپووشی بـێقـەوەت ☰ علف ریز خشکیده

**گاپـەرچۆک / gaperçok/**: نـاو. گاپەرچینکـە؛ گاپەرچێڤک؛ لەوەڕێکـە گـا حـەزی لـێدەکـا ☰ علفی مطبوع گاو

**گاپەرچینکە / gaperçînke/**: ☜ **گاپەرچۆك**

**گاپەرچێڤک / gaperçêvik/**: ☜ **گاپەرچۆك**

**گاپەڵ / gapeł/**: ☜ **گاپێڵ**

**گاپێ / gapê/**: ☜ **گاپا**

**گاپێل / gapêl/**: ناو. پێلی گەورە ☰ موج بزرگ

**گاپێڵ / gapêł/**: نـاو. گـاپڵ؛ گاپـەڵ: ١. گـاکۆتر؛

گاکەمووتــەر؛ گایــە؛ کۆترەگایــە ٢. گــای شــاخ پێچخواردوو ☰ ١. کبوتر جنگلی ٢. گاو شاخ پیچیده

**گات** / gat/: ناو. ١. گۆرانی ئایینی زەردەشتی کـە گۆســانەکان چــڕیویانن و بریتییــە لــە بەشــێکی سەربەخۆی ئاوێستا ٢. قەڵشتی شــاخی بــەردین ☰ ١. گات ٢. شکاف صخرەی سنگی

**گاتا** / gata/: ناو. نزا و نوێژ لە ئایینی زەردەشتیدا ☰ عبادت در آیین زرتشتیان

**گاتو** / gatû/: ناو. شاتوو؛ سوورەتوو ☰ شاەتوت

**گاج** / gac/: ناو. قرقرە؛ هەرچێ هەودا دەزووی لـە سەر هەڵدەکەن ☰ قرقرە

**گاجفت** / gacift/: ☜ **گاجوت ـ١**

**گاجۆت** / gacot/: ☜ **گاجوت ـ١**

**گاجوت** / gacût/: ناو. ١. گاجفت؛ گاجۆت؛ گایــێ کە زەوی دەکێڵێ ‹گــاجووت چــاوی لــە جووتیــارە «مەسەل»› ٢. *[پلار]* جنێوێکە، بە پیــاوی قەبــەی کەمئاوەزی دەڵێن ☰ ١. گاو شــخمزن ٢. دُشــنامی است

**گاچاڵ** / gaçał/: ناو. قووڵکەی زۆر فرەوان و قووڵ ☰ چالەی بزرگ

**گاچاو** / gaçaw/: ناو. گاچاوە؛ نەخشێکە لە بــەڕە و مافوورەدا ☰ نقشی بر قالی و گلیم

**گاچاوە** / gaçawe/: ☜ **گاچاو**

**گــاچوان** / gaç(i)wan/: نــاو. گۆچــان؛ داردەســتی سەرچەماوی ئەستوور ☰ چوگان کلفت

**گاچەڕینگ** / gaçeřînig/: ناو. گاچێڕین؛ بەرگایلکە؛ بەرزەردکە ☰ دُمجُنبانک

**گاچەڕێن** / gaçeřên/: ☜ **گاوان**

**گاچەڕێنک** / gaçeřênik/: ☜ **کلکهەڵتەکێنە**

**گاچێڕن** / gaçêřn/: ☜ **کلکهەڵتەکێنە**

**گاچێڕ** / gaçêř/: ☜ **گاوان**

**گاچێڕین** / gaçêřîn/: ☜ **گاچەڕینگ**

**گاحۆڵ** / gaĥoł/: ناوەڵناو. *[پلار]* زەلامی گێلۆکــە ☰ گُندەبک

**گاخ** / gax/: ناو. ١. جەغز؛ جغز ٢. جەغزی سوێند تێداخواردنی ئێــزدی ☰ ١. دایــرە ٢. دایــرەای کــە ایزدی‌ها بر زمین می‌کشند و در آن سوگند می‌خورند

**گاخانە** / gaxane/: ☜ **گەداخانە**

**گــاخۆر** / gaxor/: ناوەڵــناو. زۆرخـــۆر؛ فرەخـــوەر. هەروەها: **گاخۆری** ☰ پُرخور

**گــاخۆنی** / gaxonî/: ناو. کاری بە کۆمــەڵ گــەڕانی زارۆکــان بــۆ جێژنانــە وەرگــرتن ☰ عیدیــدنی دستەجمعی بچەها برای گرفتن عیدی

**گــادار** / gadar/: نــاو. شــوێنێ کــە گــای لــێ دەچەرێنن ☰ چراگاه گاوها

**گادانە** / gadane/: نــاو. ١. ☜ **گاینــە** ٢. گــلارە؛ گلێنەی چەم ☰ ١. ☜ **گاینە** ٢. مردُمک چشم

**گادک** / gadik/: ناو. گەدک؛ کرش؛ عوور ☰ شکمبە

**گادڵ** / gadił/: ناوەڵناو. *[مەجاز]* ئـازا و بەجــەرگ ☰ شُجاع

**گادمە** / gadime/: ☜ **گادەمە**

**گادولینیوم** / gadulînyum/: نـاو. توخمی کیمیایی کانزایی لە دەســتەی لانتانیــدەکان، بــە ژمــارەی ئەتومی ٦٤ و کێشی ئـەتومی ١٥٧,٢٥ ☰ عنصـر گادولینیم

**گادومە** / gadume/: ☜ **گادەمە**

**گــادۆش** / gadoş/: نــاو. ١. گادۆشــکە؛ گادۆشــە؛ گاوشە؛ دەفرێکی گەورە کە مالاتی تێ دەدۆشن ٢. ئەو کەسە مانگا دەدۆشــێ ☰ ١. ظـرف بـزرگ شیردوشی ٢. کسی کە گاوها را می‌دوشد

**گادۆشکە** / gadoşke/: ☜ **گادۆش ـ١**

**گادۆشە** / gadoşe/: ☜ **گادۆش ـ١**

**گادەمە** / gademe/: ناو. گادمە؛ گادومە؛ گازوانکــە؛ گازوانە؛ گاوزبان؛ گاوزمان؛ گــاوزوان؛ گــۆزروان ☰ گاوزبان

**گــادین** / gadîn/: نــاو. دووپشــک؛ دمــارەکول ☰

عقرب

**گادێر / gadêr/:** ناو. ١. خاوەن‌گا ٢. ☜ **گاوان** ☰ ١. گاودار ٢. ☜ **گاوان**

**گادێری / gadêrî/:** ناو. ١. کاری ڕەشەوڵاغ ڕاگرتن ٢. کاری ڕەشەوڵاغ لەوەڕانـدن ☰ ١. گـاوداری ٢. گاوچرانی

**گار[1] / gar/:** ☜ **گواره**

**گار[2]:** ☜ **گاره**

**ـ گار[3]:** پاشگر. ١. ـکەر؛ یار؛ کار ‹ئامۆژگار› ٢. کات و دەم ‹شەوگار؛ ڕۆژگار› ☰ ١و٢. ـگار

**گاراج / garac/:** نـاو. گاڕاج؛ گـاڕاژ؛ گـەراج؛ کـاڕاژ؛ کـاڕێژ: ١. شـوێنی بـەرفراوان بـۆ سـوار کـردنی مسافر ٢. شوێنێک بە چەن چـاوە دووکانـەوە بـۆ کەڵـتە و سـرویس کـردنی ماشـین ٣. شـوێنی سـەرگیراو لـە ماڵـدا بـۆ ڕاگـرتنی ماشـین ٤. پارکینگ؛ شوێنی گشتی بۆ ڕاگـرتنی ماشـین ☰ ١. پایانه ٢. گاراژ ٣و٤. پارکینگ

**گاراژ / garaj/:** ☜ **گاراج**

**گاران / garan/:** چـاوگ. ١. دەنگـەدەنگ کـردنی مریشـکی هێلکەکـەر و ... ٢. گـۆرانی گـوتنی زارۆی زمان‌بەرنەبوو، پێش خەو لێ کەوتن، زۆرتر لە کاتی ڕاژاندنی ☰ ١. کراخیدن مـرغ تخمگـذار ٢. غان‌وغون پیش از خواب کودک

**گارانتی / garantî/:** نـاو. گەرەنتی؛ دەستەبەری ☰ گارانتی

**گاراندن / garandin/:** چـاوگ. تێپەڕ. //گارانـدت؛ دەگـارێنی؛ بگارێنـە// گارانـدن؛ گـارانن؛ گارەگـار کردن؛ گارنای: ١. دەنگەدەنگ کردنی مریشـک کـە هێلکـە دەکـا ٢. گـۆرانی گـوتنی زارۆی زمـان‌بەرنـەبوو، پـێش خـەو لـێ کـەوتن ☰ ١. کراخیدن مرغ تخمگذار ٢. غان‌وغون کـردن کـودک پیش از خواب

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەگاراندن

**گارانن / garanin/:** ☜ **گاراندن**

**گارد / gard/:** ناو. پارێزەر: ١. پاسداری چەکدار ٢. دەستەیەکی چەکداریی کە پاراستن و چاوەدێری شـوێن یـان کەسـێکیان وە ئەسـتۆیە ‹گـاردی سەرۆک‌کۆمار› ☰ ١و٢. گارد

**گاردڕەیڵ / gardřeył/:** ناو. پەرژینی لە دیـوار یـان نـەردە بـۆ لا نـەدان و نەکەوتنـە خـوارەوە لـە شوێنێک ☰ گاردریل

**گاردی / gardî/:** نـاو. هەڵەپەزە؛ پەسپەسەکۆڵـە ☰ رُتیل

**گـارس / gars/:** نـاو. کـارس؛ جـاورس؛ گلگـڵ؛ کارسن؛ خورووڤی؛ هەرزەنەبژار؛ هەرزنەگەورە: ١. گیایەکی پایا لە تیرەی گەنم بە لقـی ژێرخـاکی، گەڵای کولکن و گوڵی هێشوویی گرۆڤـەرەوە ٢. دەنکی ئەو گیایە کـە لـە هـەرزن دەچـێ بـەڵام گەورەتر و تۆکڵەکەی ڕەقترە ☰ ١و٢. گاورس

**گارسۆن / garson/:** نـاو. پێشـخزمەت؛ سـفرەچی؛ خزمەتکاری پیـاو لـە میوانخانـە و ڕەسـتوران ☰ گارسُن

**گارسێوک / garsêwik/:** ناو. تەرزە؛ تگر ☰ تگرگ

**گارگارۆ / gargaro/:** ☜ **گارۆ**

**گارنای / garnay/:** ☜ **گاراندن**

**گارنگ / garing/:** ناو. گاڕینـگ؛ گـووگرە؛ شـتێکە وەک دەمەبێڵ لە شووڵ دەیتەنن، دەسکی هەیە و لە کاتی خۆیـان کوتانـا ڕێخـی گـاگێرەی پـێ دەگرن، نەکەوێتە ناو دەخڵەکەوە ☰ مدفوع‌گیر گاو در خرمنکوبی

**گارنگـان / garingan/:** نـاو. گیایەکـە شـیرەکەی سک ڕەوان دەکا ☰ گیاهی با شیرەی مُسهل

**گارۆ / garo/:** نـاو. گارگارۆ؛ هێلانەی مەل لە کونی داردا ☰ لانەی پرنده در سوراخ درخت

**گـاره / gare/:** دەنگـەناو. گـار؛ دەنگـی کـەرگی هێلکەکەر ☰ کراخ

**گارەگار / garegar/**: دەنگەناو. ١. گـارەی زۆر و لـە دووی یەک ٢. گۆرانی منداڵی ساوا، پـێش خـەو لێ کەوتنی ☰ ١. صدای کراخیدن متـوالی مُـرغ ٢. غان‌وغون پیش از خواب کودک

⊡ **گارەگار کردن**: ☜ **گاراندن**

**گاری[1] / garî/**: ناو. گاریە؛ فـایتوون؛ گرۆڵـە؛ شـاڵ؛ چەرخ؛ عەرەبانەی لە سـەر دوو چـەرخ کـە پتـر ئەسب دەیکێشێ ☰ گاری

**. گاری[2]**: پاشگر. ــ کـەری؛ ـ یـاری ‹ئامۆژگـاری› ☰ ـگاری

**گاریتە / garîte/**: ☜ **کاریتە**

**گاریچی / garîçî/**: ناو. گارییەوان؛ شۆفیری گـاری ☰ گاریچی

**گاریە / gar(i)ye/**: ناو. ١. ☜ **گاری[1]** ٢. کوندەی گەورەی ئاوکێش کە لە سەر بارەبـەری دادەنـێن ☰ ١. ☜ **گاری[1]** ٢. خیگ بزرگ سقّا کـە بـر سـتور نهند

**گارییەوان / garîyewan/**: ☜ **گاریچی**

**گاراج / gařac/**: ☜ **گاراج**

**گاراژ / gařaj/**: ☜ **گاراج**

**گارام / gařam/**: نـاو. گارامـە: ١. گـاران؛ گـارم؛ گارۆن؛ داری دەسـتی جووتێر لە کاتی شێو کردنا کە سەرێکی بە نەقیزە و سەرێکی بە پیشـکانە ٢. تێلای ئەستوور ☰ ١. غاوشنگ ٢. چوبدستی کلفت

**گارامە / gařame/**: ☜ **گارام**

**گـاران / gařan/**: نـاو. ١. ☜ **گاگـەل** ٢. ☜ **گارام‍ـ١** ٣. *[سووکەڵـە]* گا و ران؛ گاگەل و مێگـەل پێکـەوە ☰ ١. ☜ **گاگـەل** ٢. ☜ **گارام ـ١** ٣. گلەی گاو گوسفند با هم

⊡ **گـاران هـاتن/ هاتنـەوە**: کـاتی لـە لـەوەڕان گەڕانەوەی گاران بۆ گوند ‹... خـۆ ئێـوارە هـەر باسی ناکرێ؛ سەعاتێک پێش گـاران‌هـاتن، بـەرەو گاران غار دە و لە ڕێ تووشی بە و پێچی سەر یـان تیتولە پشتێند، دە ملی کـەرێکی ڕووتی بـێ جـل هاڵـێنە و خـۆ بـاوێ سـەری «هـەژار، چێشـتی مجێور» ☰ برگشتن حیوانات اهلی به روستا

**گارگارە / gařgaře/**: ناو. بڕبڕاگە؛ مۆرەغە؛ مازگە ☰ ستون فقرات

**گارم / gařim/**: ☜ **گارام‍ـ١**

**گـارۆن / gařon/**: نـاو. ١. ☜ **گاگـەل** ٢. ☜ **گارام‍ـ١**

**گارەش / gařeş/**: ناو. ڕەشەوڵاغ؛ ڕەشـەماڵ؛ گـا و چـێل و کـەڵ و گـامێش ☰ چهارپا؛ دام غیـر از گوسفند و بز

**گارینگ / gařîng/**: ☜ **گارنگ**

**گاز[1] / gaz/**: ناو. ١. گەز؛ قەپ؛ قەپە؛ گازە؛ گـەزە؛ گەوز؛ لـەق؛ کـاری چەقانـدنی ددان لـە شـتێک ‹خواردن، خواردنە؛ بە کەوچک و کێرد و چنگاڵ بـێ، یان بە چنگ و نینۆک و گـاز بـێ «هـەژار، چێشـتی مجێور» ٢. لەلە؛ کاری خەت لـە دار کـردن بـە تیخ ٣. ☜ **گازک** ٤. بەشی جارێک دەستەچیلە بۆ ئاگر کردنەوە ٥. بانگ؛ قـاو ‹بچـۆ! بابـت گـازت دەکا› ٦. زنجیرەکێو ٧. لا؛ ئالێ ‹‹لە هـەر گـاز و ڕێبازێ وا گـازی ئـاوی دەگاتـێ «سـوارە»› ٨. غـاز؛ ماکی بێ بیچم و بێ سنوور، یەک لە چوار جۆری ماک ‹گاز، تـراو، جامیـد و پلاسمـا› ‹ئـەم خەڵـووزە گازی هەیـە› ٩. شکێر؛ گابـارە؛ قەڵشتەشـاخ ١٠. شـیوی زۆر تـەنگ ١١. درێژایـی لـە جومگـەی دەسـتەوە تـا شـان ١٢. تێکەڵـێک لـە میتـان و بووتان، کە بـۆ سـووتانە ١٣. ☜ **گـەز[1]ـ٤** ١٤. پەلی ئاژەڵ؛ دەست و قاچی حەیوان ١٥. ترۆپک؛ بڵـندترین جێگـەی چیـا ١٦. کەرەسـتەی گازسووتێن، وەک وەجاخ گاز ‹چێشتەکە بنە سەر گاز› ١٧. پارچەی نەرم و لە بەن تەنراو بـۆ بـرین پێچـان ١٨. گـازک؛ مەشـە؛ هـەمۆر؛ ئـامرازی دووپـەلی بزمارکێشـانەوە، گوشـاردان و ... ١٩.

☜ **گازی**[1] ☰ ۱. گاز دندان ۲. شیار روی چوب ۳. ☜ **گازك** ۴. پودەی لازم یک افروزنە ۵. صدا؛ بانگ ۶. رشتەکوە ۷. سمت؛ جانب ۸. گاز؛ یکی از حالات مادە ۹. شکاف در کوە سنگی ۱۰. درّەی تنگ ۱۱. طول دست از مُچ تا شانە ۱۲. گاز طبیعی قابل اشتعال ۱۳. ☜ **گەز**[1]ـ٤ ۱۴. دست و پای حیوان ۱۵. قُلە ۱۶. اُجاق گاز ۱۷. گاز پانسمان ۱۸. گازانبُر ۱۹. ☜ **گازی**[1]

▣ **گازی پشت** دوڕ پشت؛ ناوەڕاستی پشت ‹هەردوو لاقم لە ژێرم دەرچوو بە گازی پشت دام بە زەویدا› ☰ وسط پشت

**گازی خەردەل:** تراوێکی سووک، چەور، بێ‌ڕەنگ و بۆن‌تیژ (بە بۆنی خەردەل) کە بە خۆیەوە دەبێتە هەڵم و ئەگەر چاو، پێست و بەتایبەت کۆئەندامی هەناسە داگرێ، گیاندار تا شەرای مەرگ دەبا ☰ گاز خردل

**گازی زەلکاو:** میتان ☰ گاز مُرداب

**گازی سروشتی:** گازی ئاسایی؛ تێکەڵاوێک لە چەند هیدرۆکەربون، بەتایبەت میتان و بووتان، کە لە ژێر زەوی و زۆرتر لەگەڵ نەوتدایە ☰ گاز طبیعی

**گازی فرمێسک:** هەرکام لەو گازانەی لە ڕێگەی هەناسەوە دەچێتە ناو خوێن و دەمارەکانی چاو و فرمێسک ڕژاندن دنە دەدا ☰ گاز اشک‌آور

**گازی نایاب:** هەرکام لەو توخمانەی لە خشتەکی مەندەلیوفدا لە ئەستوونی سیفردان و بەشێکی بچووک لە کەش پێک دێنن و بریتین لە: هلیوم، نیئون، ئارگون؛ کریپتون، گزێنون و ڕادوون ☰ گاز نجیب

▣ **گاز دان:** گازاندن؛ پا لە سەر پیداڵی گاز نان بۆ زۆرترکردنەوەی خێرایی ماشین ☰ گاز دادن

**گاز کردن:** ۱. بڕین و قەڵشی چکۆڵە تێ کردن ۲. چڕین؛ قاو/ بانگ کردن ☰ ۱. شکاف کوچک در چیزی ایجاد کردن ۲. صدا زدن

**گاز گرتن:** ۱. گەز گرتن؛ گەژ کرن؛ بە ددان گرتن؛ قەپ گرتن ۲. بە گاز خنکان ☰ ۱و۲. گاز گرفتن

**وە بەر گاز دان:** قەپ لێ گرتن ‹دوو ساندویچی گۆشت کەرم وە بەر گاز دا! «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ بە دندان کشیدن

**گاز**[2]**:** ئاوەڵناو. بەرز؛ درێژ ‹گەردن‌گاز› ☰ بلند

**گاز**[3]**:** ☜ **گاس**

**ـ گاز**[4]**:** پاشوشە. ـ بردوو؛ ـ گەستوو ‹خۆران‌گاز؛ تاوانگاز›. هەروەها: **ـ گازی** ☰ ـ زدە

**گازارە** / gazare/: ناو. ۱. ئەستووری؛ کوڵوفتی ۲. [مەجاز] پتەوی؛ قایمی ‹ئەم پارچەیە گازارەی باشە بۆ بەرگی کار دەبێ› ☰ ۱. ضخامت ۲. استحکام

**گازارەدار** / gazaredar/: ئاوەڵناو. ئەستوور ☰ کُلُفت

**گازاژۆ** / gazajo/: ئاوەڵناو. ژاکاو بە هۆی گازەوە ☰ گازگرفتە

**گازاژۆیی** / gazajoyî/: ☜ **گازگرتوویی**

**گازاندن** / gazandin/: چاوگ. ۱. ☜ **گاز دان** ۲. گاز کردن؛ جاڕ دان؛ بە دەنگی بەرز ڕاگەیاندن ☰ ۱. ☜ **گاز دان** ۲. جار زدن

**گازاو** / gazaw/: ناو. گەڕاو؛ گەراو؛ گەرماو؛ گەرمکاو؛ ئاوی کانی گەرمک ☰ آب چشمەی گرم

**گازاییل** / gazayîl/: ☜ **گازۆییل**

**گازتین** / gaztîn/: ناو. گاستین؛ جێ کۆ بوونەوە بۆ سانەوە ☰ کلوپ؛ باشگاە

**گازر** / gazir/: ناو. ۱. قەسار؛ جلشۆر ۲. جۆرێ قوماش ‹ئەڵێی پەروانەی دەوری ئاگرم/ خۆیشم نازانم چۆنە نامرم/ ڕەنگ سپی ئەڵێی جاوی گازرم «فولکلۆر»› ☰ ۱. گازُر؛ رختشور ۲. نوعی پارچە

**گازك** / gazik/: ناو. گاز؛ گازک؛ گاسک؛ مەشە؛ هەمۆر؛ گۆس؛ ماشەرز؛ کەلبەتان؛ ئامرازێکی دووپەلە بۆ گرتن، گوشار دان، کەندنەوە و

برینەوەی سیم و بزمار کێشانەوە و ... ☰ گازانبر

**گازگاز** / gazgaz/: ناو. داد و هاوار ☰ داد و فریاد

**گازگر** / gazgir/: ☜ **گەزندە ـ١**

**گازگرتـووی** / gazgirtûyî/: نـاو. گازەنگـازی؛ گازاژۆیی؛ ڕەوتی گـاز گـرتن؛ خنکـان بـە هـۆی گـازی ژاراوی بەتایبـەت گـازی مۆنۆکسـیدی کەربونـەوە ‹بنەماڵـەیەکی چوارکەسـی بـە هـۆی گازگرتوویییەوە خنکان› ☰ گازگرفتگی

**گازگەدر** / gazgedir/: ناو. وڕاوە؛ وڕینـە؛ وڕێنـە ☰ هذیان

**گـازن** / gazin/: نـاو. ١. ☜ **گازنـدە** ٢. شـفرەی زیندروو؛ ئامرازی چەرمبڕی دەستی چەرمکـار ☰ ١. ☜ **گازندە** ٢. چرمبُر سرّاجی

**گازنای** / gaznay/: چاوگ. گـاز لـێ گـرتن ☰ گـاز گرفتن

**گازندۆک** / gazindok/: ئاوەڵـناو. بـە پرتـە و بۆڵـە؛ دەم بە گلەیی ☰ غُرغُرو

**گازنـدە** / gazinde/: نـاو. گـازن؛ گازەنـدە: ١. سـەرکۆنەی دۆسـتانە ‹گلـە و گازنـدە› ٢. داد؛ شکات؛ شکایەت ‹دڵم سەد هێندی دیکانە، بـە نـاز بشکێنی دەنـگ ناکـەم/ چ سـوودیکی هەیـە؟ کێیـە بپرسێ داد و گازندە؟ «هێمن»›. هـەروەها: **گازنـدە کردن** ☰ ١. عتاب دوستانە ٢. شکایت

**گازنـدەکـەر** / gazindeker/: ئاوەڵـناو. بەگلـەیی؛ بەگازندە ☰ گلەمند

**گازندەنامـە** / gazindename/: نـاو. سـکالانامە ☰ شکایتنامە

**گازندەوان** / gazindewan/: ناو. دادخواز؛ شـکاتکار ☰ دادخواە

**گازنکار** / gazinkar/: ئاوەڵناو. گلەمەند؛ گلەمەن ☰ گلەمند؛ شاکی

**گازوانکە** / gaz(i)wanke/: ☜ **گادەمە**

**گازوانە** / gaz(i)wane/: ☜ **گادەمە**

**گازولـک** / gazulik/: نـاو. ١. ☜ **گوخلێتکـە** ٢. کەرمێش ☰ ١. ☜ **گوخلێتکە** ٢. خرمگس

**گازۆر** / gazor/: ئاوەڵناو. *[پلار]* بەقەوەت؛ زۆردار ☰ خرزور

**گـازۆز** / gazoz/: نـاو. ١. گـازیز؛ مۆرکـە؛ مـۆرد؛ قاروونە؛ وەرە؛ جانەوەری وردیلەی خوریخۆر ٢. خواردنەوەی گازدار ☰ ١. بید؛ حشرەی پشمخوار ٢. نوشابەی گازدار

**گازۆک** / gazok/: ناو. ١. قامیشی دەم قەڵشـێنراو بۆ گرتنی مار ٢. دارێکی دوو سـەرە بـۆ ڕێـوی و کەروێشک لە کون دەرهێنان ٣. قووڵایی سـەری کۆڵەکە، خەسارە لە سەری ڕادەوەستێ ☰ ١. نـی سر شکافتەی مارگیری ٢. چوب دوسرِ بیرون کشیدن روباە و خرگوش از لانە ٣. گودی بـالای سـتون کـە تیرک بر آن جای میگیرد

**گازۆڵ** / gazoł/: ☜ **گازۆییل**

**گازۆڵی** / gazołî/: ☜ **گازۆییلی**

**گازۆییـل** / gazoyîl/: نـاو. گـازۆڵ؛ گازاییـل؛ بەرهەمێکی نەوتی بۆ سووتەمەنی ☰ گازوئیل

**گـازۆییلی** / gazoyîlî/: ئاوەڵـناو. گازۆڵـی: ١. گازۆییل پێوەتلاو ٢. بە تایبەتمەندی سـووتاندنی گازۆییلەوە ‹لۆری گازۆییلی› ☰ ١و٢. گازوئیلی

**گازووڵک** / gazûłik/: ☜ **گوخلێتکە**

**گـازە** / gaze/: نـاو. ١. دەنگـی گـۆرانی ٢. کـاری پاڕانـەوە بـە دەنـگ ٣. بۆڵـە و پرتـە ٤. گـازن؛ شفرەی چەرمبڕ ☰ ١. نوا؛ صدای تـرنُم ٢. مُناجـات ٣. غُرولند ٤. چرمبُر

**گازەدوک** / gazedûk/: ناو. گاز؛ شیوەڵـەی تـەنگ ☰ درّەی تنگ

**گـازەرا** / gazera/: نـاو. گـازی پشـت؛ ناوەڕاسـتی پشت ☰ وسط پُشت

**گازەگاز** / gazegaz/: ناو. دەنگەدەنگ؛ هەراهەرا ☰ سروصدا

**گازەڵ** / gazel/: ناو. خەزەڵ؛ گەڵای زەرد یان سوورهەڵگەڕاوی خەریکی وەرین ☰ برگ خزان

**گازەندە** / gazende/: ☜ **گازندە**

**گازەنگ** / gazeng/: ناو. کەڵەزەنگ؛ ژام؛ زەنگی گەورەی کلێسە ☰ ناقوس

**گازەنگازی** / gazengazî/: ☜ **گازگرتویی**

**گازی**[1] / gazî/: ناو. گاسی؛ گاز؛ بانگ؛ قاو؛ کاری بە دەنگ هەرا لێ‌کردن ‹لە هەر گاز و ڕێبازێ وا گازی ئاوی دەگاتێ «سوارە»› ☰ بانگ؛ عمل صدا زدن

▣ **گازی کردن/ کرن:** بانگ/ قاو کردن ‹بە سێ دەنگان گازی دەکا: کوڕە ماڵوێران! «پایزە»› ☰ صدا زدن

**گازی**[2]: ناوەڵناو. گازسووتێن ‹سۆبەی گازی› ☰ گازی

**گازیای** / gazyay/: چاوگ. گاز لێ‌گیران ☰ گاز گرفته شدن

**گازیز** / gazîz/: ناو. ١. ☜ **گازۆز ـ١** ٢. کرمی ناو داری میوە ☰ ١. ☜ **گازۆز ـ١** ٢. کرم درخت

**گازیکەر** / gazîker/: ناو. قاوکەر؛ کەسێ کە بانگ لە کەسێ دەکا ☰ ندا دهندە

**گازین** / gazîn/: چاوگ. ١. شکایەت کردن ٢. دەردی‌دڵ کردن ☰ ١. شکایت کردن ٢. درددل کردن

**گاژ** / gaj/: ☜ **گلۆلە**[1]**ـ١**

**گاس**[1] / gas/: ناو. گاز؛ قاو؛ بانگ ☰ بانگ؛ صدا

**گاس**[2]: ناوەڵکار. گاهەس؛ گاهەز؛ گاز: ١. دەبێ؛ وەختی وا هەیە ٢. ئەشێ؛ ویدەچێ؛ ئەگونجێ؛ ڕێی تێدەچێ ‹گاس بێ، گاس نەیا› ☰ ١. گاه باشد ٢. شاید

**گاسار** / gasar/: ناو. ١. کۆلکەی مێو کە لە پاش بڕین دەمێنێ ٢. داری دووحاچەی سەری گوریسی دابەستن ☰ ١. تەشاخەهای باقیماندە مو پس از بُریدن ٢. چوب دوشاخەای کە یک سر طناب را بدان محکم می‌کنند

**گاستار** / gastar/: ناو. هێچک؛ چاکڵ؛ ئاڵقەی دارینی سەری گوریس ☰ حلقەی چوبین بە طناب بستە شدە

**گاستین** / gastîn/: ☜ **گازتین**

**گاسک** / gasik/: ☜ **گازك**

**گاسکە** / gaske/: دەنگەناو. قرووسکەی سەگ ☰ زوزەی سگ

**گاسن** / gasin/: ناو. ١. ☜ **گاواسن** ٢. ☜ **گاسنگە**

**گاسنگە** / gasinge/: ناو. گاسن؛ مەیدانی فرەوانی؛ ناوەندی ئاوایی ☰ میدان وسط آبادی

**گاسنۆق** / gas(i)noq/: ☜ **گاسنوق**

**گاسنوق** / gas(i)nûq/: ناو. قاسە؛ گاسنۆق؛ گاوسنۆق؛ سندووقی قورس و قایم لە پۆلا، بۆ هەڵگرتن و پاراستنی پارە و بەڵگەی بە بایەخ ☰ گاوصندوق

**گاسنە** / gas(i)ne/: ناو. کاری جارێک شێف بڕین ☰ عمل یک بار شخم زدن

**گاسۆس** / gasos/: ناو. گیایەکە دەگەڵ ژاژی دەکرێ ☰ گیاهی کە با کشک آمیزند

**گاسی** / gasî/: ☜ **گازی**[1]

**گاشکە** / gaşke/: ناو. هەڵووچە؛ هەڵووژە ☰ آلو

**گاشە**[1] / gaşe/: ناو. ١. ☜ **گاشەبەرد** ٢. ئاژاوە و پشێوی ☰ ١. ☜ **گاشەبەرد** ٢. آشوب و بلوا

**گاشە**[2]: پێشوشە. ١. گەورە؛ زل؛ زلە ‹گاشەبەرد› ٢. زۆر؛ فرە ‹گاشەخۆر› ☰ ١. بزرگ ٢. زیاد

**گاشەبەرد** / gaşeberd/: ناو. گاشە؛ بەردی گەورە؛ تەلەسەنگ ☰ تختەسنگ

**گاشەخۆر** / gaşexor/: ناوەڵناو. *[کینایە]* خۆرت و بەهێز ‹... یەک لە بەگلەربەگانی عوسمانی کە خۆی بە گاشەخۆر دەزانی، سەرەڕێی لە محەمەدی گرت و نیازی گرتنی دەدڵ گرتبوو «هەژار، *شەرەفنامە*»› ☰

قُدرتمند

**گـاف / gaf/**: نـاو. ١. گـێ؛ نـاوی پـیتی بیستوسێهەمی ئەلفوبێی زمانی کوردی ٢. گام؛ گاو؛ لە شوێن یەک ڕیز بوونی هەشت نۆتی مووسیقا بە شێوەی ئاسایی خۆیان (حەوت نۆت و دووپاتەی نۆتی سەرەتایی) ☰ ١. گاف؛ حرف بیست و سوم الفبای زبان کُردی ٢. گام موسیقی

**گاڤاره / gafare/**: ناو. بێشکە؛ لانک؛ لانکە ☰ گهواره

**گاڤ / gav/**: ناو. ١. دەم؛ کات؛ سات ٢. شەقار؛ قەدەم؛ هەنگاو ☰ ١. گاه؛ هنگام ٢. گام

⊡ **گاڤ ناڤێتن:** *[مەجاز]* دەست بە کارێک کردن؛ دەست بۆ کارێک بردن ‹ئاگرنیگ ئەوە کە تو گاف بناڤێژی› ☰ اقدام کردن

**گاڤ دان:** ١. پیاسە کردن؛ قەدەم لێدان ٢. دەرفەت پێ دان ☰ ١. قدم زدن ٢. مُهلت دادن

**گاڤا / gava/**: ئاوەڵکار. لە دەمێکا؛ دەمێکی ☰ هنگامی

**گاڤان[1] / gavan/**: چاوگ. پیاسە کردن؛ قەدەم لێدان ☰ قدم زدن

**گاڤان[2]**: ☜ **گاوان**

**گاڤانی / gavanî/**: ☜ **گاوانی**

**گاڤانێ / gavanê/**: ئاوەڵکار. ١. جاروبار؛ جاروبارە؛ چەلچەلە ٢. هەنگاو بە هەنگاو ☰ ١. گاهگاه ٢. قدم به قدم

**گاڤبەر[1] / gavber/**: ناو. دوژمن؛ دژمن ☰ دشمن

**گاڤبەر[2]**: ئاوەڵناو. ١. دوژمن ٢. بەئێرەیی ☰ ١. دشمن ٢. حسود

**گاڤپێڤ / gavpîv/**: ناو. کاری بە هەنگاو پێوان ☰ عمل با گام اندازه گرفتن

**گاڤر / gavir/**: ناو. ١. ☜ **گاور** ٢. نەخۆشییەکی گایە پێ دەفیرێنێ ☰ ١. ☜ **گاور** ٢. از بیماریهای گاوی

**گاڤشکی / gavişkî/**: ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. کتوپڕی؛ کتوپڕ؛ ناخافڵ ☰ ناگهانی

**گاڤگاڤ / gavgav/**: ئاوەڵکار. جاروبار؛ جار ـ جار ☰ گاهگاه

**گاڤگوشاد / gavguşad/**: ئاوەڵناو. لۆقلۆقی؛ لۆقی ☰ گامفراخ

**گاڤۆر / gavor/**: ناو. سەرماوەز؛ ئازەر؛ ساران ☰ آذر ماه

**گاڤەستی / gavestî/**: ناو. ئەو ماڵانەی ناچنە هەوار و لە ئاران دەمێننەوە ☰ خانههایی که به ییلاق نمیروند

**گاڤەک / gavek/**: ئاوەڵکار. ١. شەقامێک؛ هەنگاوێک ٢. جارێ؛ هەلێ ☰ ١. گامی ٢. یکبار

**گاڤی / gavî/**: ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. کاتی؛ نەهەمیشە ☰ موقتی

**گاڤین / gavîn/**: ناو. ئەوپەڕی مەبەست ☰ مُنتهای مرام

**گاڤێتن / gavêtin/**: چاوگ. پیاسە کردن؛ ڕێ چوون ☰ راه رفتن

**گاقڕ / gaqiř/**: ☜ **گاقڕان**

**گاقڕان / gaq(i)řan/**: ناو. گاقڕ؛ نەخۆشی گا مردن بە گەل ☰ مرگ و میر گاوها

**گاقۆڕ / gaqoř/**: ناو. ١. ☜ **گابۆڕ** ٢. *[کینایە]* مانگی سەرماوەز ٣. *[کینایە]* مانگی گەلاوێژ ☰ ١. ☜ **گابۆڕ** ٢. آذرماه ٣. مُرداد ماه

**گاکوچک / gakuçik/**: ☜ **گابەرد**

**گاکوژ / gakuj/**: ناو. *[کینایە]* کێردی گەورە و دەمپان ☰ کارد سلاخی

**گاکوڵ / gakuł/**: ناو. بەراز؛ خوو ☰ گُراز

**گاکۆتر / gakotir/**: ☜ **گاپێڵ-١**

**گاکۆڤی / gakovî/**: ☜ **گەوەزن**

**گاکوڤی / gakûvî/**: ☜ **گەوەزن**

**گاکەموتەر / gakemûter/**: ☜ **گاپێڵ-١**

**گاکێفی** / gakêfî/: ☜ **گەوەزن**

**گاکێوی** / gakêwî/: ☜ **گەوەزن**

**گا ـ گا** / ga ga/: ناوەلکار. گا ـ گوار؛ جار ـ جار ☰ گاهگاه؛ گاه‌گُدار

**گا ـ گایێ** / gagayê/: ناوەلکار. گابەگایی؛ ناوبەناو؛ جارجارێ ☰ گاهگاهی

**گاگر** / gagir/: ☜ **گاگیر**

**گاگروس** / gag(i)rus/: ☜ **گاگۆز**

**گاگلێنە** / gag(i)lêne/: ناو. تاتوولە؛ گیایەکی ژاراوییە ☰ گیاهی سمی

**گا.گوار** / gag(i)war/: ☜ **گا ـ گا**

**گاگوس** / gagus/: ناو. ترکی مەسیحی ☰ تُرکِ مسیحی

**گاگوێ** / gag(i)wê/: ناو. گیایەکی گەلاپانە ☰ گیاهی است

**گاگۆڕ** / gagoř/: ناو. ١. گۆڕیچە ٢. قەبر بە گۆڕیچەوە ☰ ١. لحد ٢. قبر و لحد با هم

**گاگۆز** / gagoz/: ناو. گاگروس؛ گاگووز؛ پۆلکە ☰ گیاه خلر

**گاگۆلکە** / gagołke/: ☜ **گاولکێ**

**گاگۆلکێ** / gagołkê/: ☜ **گاولکێ**

**گاگۆلە** / gagołe/: ☜ **گاولکێ**

**گاگو**[1] / gagû/: ناو. ڕیخ؛ شیاکە؛ سەرین ☰ سرگین

**گاگو**[2]: ناوەلناو. *[پلار]* گاگوول؛ نەفام؛ هیچنەزان ☰ نفهم

**گاگووز** / gagûz/: ☜ **گاگۆز**

**گاگوول** / gagûl/: ☜ **گاگو**[2]

**گاگە** / gage/: ☜ **کاکە**

**گاگەل** / gagel/: ناو. گائەل؛ گایەل؛ گاران؛ گاڕۆن؛ گاگەلە ☰ رمەی گاو

⊡ **کردنە گاگەل**: *[پلار]* دەست لە خوێندن بەردان ‹کوڕەکەی دوو ساڵە کردگیەسە گاگەل، عەتاڵوبەتاڵە و هیچ ناکا!› ☰ ترک تحصیل کردن

**گاگەلە** / gagele/: ☜ **گاگەل**

**گاگەلەوان** / gagelewan/: ناو. گالەوان؛ گایەلەوان ☰ گاوچران

**گاگیر** / gagîr/: ناوەلناو. گاگر؛ تایبەتمەندی زەوینێ کە گاسن تێیدا گیر بکا ☰ ویژگی زمینی کە گاوآهن در آن گیر می‌کند

**گاگێج** / gagêc/: ناوەلناو. گەوج؛ حۆل ☰ ابله

**گاگێرە** / gagêre/: ناو. ١. گاهۆڵە؛ چێڵ و گا کە خەرمانیان پێ دەکوتن ٢. گێرە؛ هۆڵە ‹قەزای ئەو تۆزی گاگێرەی سەپانە/ لە دوو سەد قەسر و کۆشکی میر و خانان «قانع»› ☰ ١. گاو خرمنکوب ٢. خرمنکوبی

**گالا** / gala/: ناو. هێرش؛ هرۆژم ☰ یورش؛ هجوم

**گالاکتوز** / galaktuz/: ناو. شەکرێکی سپی بلۆرینە کە لە ئاودا دەتوێتەوە و پێکهێنەری شەکری شیر و برێ گیایە ☰ گالاکتوز

**گالتین** / galtîn/: ☜ **گاڵتێن**

**گالر** / galir/: ناو. گوڵی زەمەق ☰ زنبق

**گالش** / galiş/: ناو. ژێرپیاڵە؛ ناڵبەکی ☰ نعلبکی

**گاللۆر** / gallor/: ناو. ئێسکی بەلەک ☰ استخوان ساق

**گالۆک** / galok/: ناو. ١. گالۆک؛ تێلای ئەستوور ٢. مەساسەی دەستی جووتکەر ☰ ١. چُماق کُلُفت ٢. غاوشنگ

**گالۆم** / galom/: ناو. گۆپاڵ؛ تۆپز؛ کوتەکی سەرئەستوور ☰ چُماق

**گالو** / galû/: ☜ **گاوان**

**گالوف** / galûf/: ناو. گیایەکی دەشتییە ☰ از گیاهان صحرایی

**گالە** / gale/: ناو. خۆرج؛ تێر؛ هەگبەی پشت زین ☰ خُرجین

**گالەگورت** / galegurt/: ناو. پاشملە؛ پاشەملە؛

خوسپ؛ خراپەبێژی ئەم و ئەو لە نەبوونیاندا 🇮🇷 غیبت

**گالـەگوڕی** / galeguřî/: ئاوەڵـناو. چەنـەوەر؛ چەقەسرۆ 🇮🇷 وراج

**گالەوان** / galewan/: ناو. گایەلەوان؛ گاگەلەوان 🇮🇷 گاوچران

**گالیسک** / galîsk/: ناو. ئامرازی دار کۆڵین 🇮🇷 ابزار کندەکاریِ چوب

**گالیسکە** / galîske/: ☜ کالیسکە

**گالیک** / galîk/: ئاوەڵناو. فەڕانسی؛ سەر بە فەڕانسە 🇮🇷 گالیک

**گالینگور** / galîngur/: ناو. چەرمی دەستکرد (بۆ بەرگی کتێب و ...) 🇮🇷 گالینگور

**گالیوم** / galyum/: ناو. توخمی کیمیایی کانزایی بە ژمارەی ئەتومی ٣١ و کێشی ئەتومی ٦٩,٧٢ کە وەک زیو بریقەدارە و لە چێ‌کرنی دەماپێوی تایبەت بە تینی زۆر، کەڵکی لێ‌دەگرن 🇮🇷 عُنصر گالیم

**گـالێش** / galêş/: نـاو. بارەگیـای یەکسـەری؛ تەرمەکی گیا 🇮🇷 یک بارِ باربر گیاه

**گاڵ**[1] / gał/: ناو. ١. کاری بە هەرا و هوریا ڕاو نـان ‹لێرە گالـیان دا› ٢. هەرزنەتاڵە؛ هەرزنەگـەورە 🇮🇷 ١. عمل هو کردن ٢. ارزن تلخ

▣ **گـاڵ دان**: ١. دەرکـردن بـە هـەرا و هوریـا ٢. دنەدان؛ هانەدان 🇮🇷 ١. هو کردن و بیرون رانـدن ٢. برانگیختن

**گاڵ لە مشتی کەسێک هەڵنەورین**: دەس‌قووچـاو بوون ‹گاڵ هەڵنەوەرێ لە درزی مشتی/ دۆشەک ڕابخا و شان لە سەر پشـتی «قـانع»› 🇮🇷 خسـیس بودن

**گاڵ یا جۆ/ پەمۆ هاتن**: باش یان خراپ هاتن 🇮🇷 پُر یا پوچ آمدن

**گاڵ**[2]: پێرۆ. ← **گروگاڵ**

**گاڵ**[3]: لێل. ← **گاڵوبۆغ**

**گاڵتە** / gałte/: ناو. گەڵتە: ١. شـۆخی ‹بـۆ دەبـێ بێت و بکا مەیخانـە تـەنگ؟/ شـوێنی دیکـە زۆرە بـۆ گاڵتە و جەفەنگ! «هێمن»› ٢. قومار؛ یاری؛ بازی؛ کایە ‹ئیتر لە خۆشی دینار بە لێشاو/ گاڵـتە و یـاری وەک تەیری سەر ئاو «موفتی پێنجوێنی»› ٣. تیـز؛ تنار؛ هەلک 🇮🇷 ١. شوخی ٢. بازی ٣. مسخره

▣ **گاڵتە پێ‌کردن**: ١. تیز پـێ‌کـردن ‹خولاسـە زۆر کەس ... ویستوویانە بەهرە لە من بەرن و بۆخۆیان خۆش بژین و گاڵتە بە سادەیی و خۆش‌باوەڕی من بکـەن! «هــەژار، چێشــتی مجێــور»› ٢. بــە لەیستۆک یاری کردن 🇮🇷 ١. مسـخرە کـردن ٢. بازی کردن با اسباب‌بازی

**گاڵتە کردن**: ١. شۆخی کردن ٢. یـاری کـردن؛ کایە کردن 🇮🇷 ١. شوخی کردن ٢. بازی کردن

**گاڵتە هاتن**: کایە هاتن؛ لە سەر بـاری گەمـە و گاڵتە بوون 🇮🇷 شوخی آمدن

**گاڵتەباز** / gałtebaz/: ئاوەڵناو. لێپۆک؛ تیتاڵ‌باز 🇮🇷 لوده

**گاڵتەبێژ** / gałtebêj/: ئاوەڵناو. نکتەبێژ؛ قسەخۆش 🇮🇷 لوده

**گاڵتـەجاڕ** / gałtecař/: ئاوەڵـناو. گـەپچاڕ؛ تیتاڵـی ‹کوێخا خواکەرەم پـیر و دارزیـو/ گاڵـتەجاڕی هـۆز، گشت هەتیو ـ مەتیو «قانع»›. هەروەها: **گاڵتەجاڕی** 🇮🇷 مسخره

**گاڵتـەچی** / gałteçî/: نـاو. حەنـەکبێـژ؛ کەسـێ قسەی سەیر دەکا بۆ پێکەنین 🇮🇷 لوده

**گاڵتەوگەپ** / gałte w gep/: ☜ **گەپوگاڵتە**

**گاڵتین** / gałtîn/: ☜ **گاڵتێن**

**گـاڵتێن** / gałtên/: ناو. گاڵتین؛ گاڵتین؛ کـاری بـە حەنەک ئاخافتن 🇮🇷 لودگی

**گاڵگـاڵی** / gałgałî/: نـاو. کـولێرەی بــە ڕۆن و زەردێنەی هێلکە 🇮🇷 نوعی گردەی روغنی با زردەی

تخم‌مرغ

**گاڵنای** / gałnay/: چاوگ. گاڵوبۆغ کردن؛ گڕوگاڵ کردن ☰ سروصدا کردن بچه‌ی تازه زبان بازکرده

**گاڵوانیزه** / gałwanîze/: ناو. به کانزای ڕۆح سواخ‌دراو (زیاتر بۆ ئاسن و پۆلا) ☰ گالوانیزه

**گاڵوبوغ** / gał û buğ/: ☜ **گڕوگاڵ**

**گاڵوبۆغ** / gał û boğ/: ☜ **گڕوگاڵ**

**گاڵوێن** / gałwên/: ☜ **گاڵۆن**

**گاڵۆش** / gałoş/: ناو. پاته؛ پاتی؛ پێڵاوێکی لاستیکی که له قوڕ و تەڕ و تووشیدا دەیکەنە سەر کەوشی چەرمیوه ☰ گالُش

**گاڵۆک** / gałok/: ناو. ۱. گۆچان ‹باڵام وەک گاڵۆک چەماوەتەوە› ۲. ☜ **گاڵۆک ـ۱** ☰ ۱. عصا ۲. ☜ **گاڵۆک ـ۱**

**گاڵۆن** / gałon/: ناو. گالوێن؛ پووت؛ پیت ☰ گالُن

**گاڵە**[1] / gałe/: ناو. ۱. داد و هاوار به نارەحەتی ۲. ئازایەتی له کاردا ۳. گۆڵە؛ هەورەگرمە ٤. گۆڵە؛ کاری داخستنی دەرک و پەنجەره ☰ ۱. داد و فریاد ۲. نشاط و چالاکی در کار ۳. تُندر؛ رعد ۴. عمل بستن در و پنجره

▣ **گاڵە پێکردن**: به هیچ نەزانین؛ گەمە پێ کردن ‹مشت و ماڵی دەوێ ئاوێنەیی ژەنگاوی خەیاڵ/ مەست و گێژم که هەتا گاڵە به جامی جەم کەم «هێمن»› ☰ به بازی گرفتن

**گاڵە دان**: داخستنی دەرگا و پەنجەره ‹درگای له سەر خۆی گاڵە داوە، کەس نابینێ!› ☰ بستن در و پنجره

**گاڵە کردن**: حەشر کردن؛ چاک وەخۆ کەوتن له کارێکدا ‹گەرمایەکی سەخت بوو، تۆزی ماشینیش گاڵەی دەکرد «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ کولاک کردن

**گاڵە**[2]: دەنگەناو. ۱. دەنگی پێکەنینی ساوا ۲. دەنگی تێکەڵاوی باڵداری دەنگ‌خۆش ☰ ۱. صدای خنده‌ی نوزاد ۲. صدای پرنده‌های خوش‌آواز

**گاڵەبەنگ** / gałebeng/: ناو. گیایەکه بۆ دەرمان دەشێ ☰ گیاه گالبنگ؛ قنطوریون

**گاڵەخۆره** / gałexore/: ناو. باریکە؛ هەرزنەکێ؛ مەلێکە له تۆرەمەی بەرگاویله ☰ پیت خاکی

**گاڵەدراو** / gałed(i)raw/: ئاوەڵناو. بەستراو؛ داخراو ☰ بسته شده

**گاڵەگاڵ** / gałegał/: ناو. هەراهەرا ‹شەماڵ هات به گاڵەگاڵ، هەور بوون گەواڵ-گەواڵ/ پشکوت گوڵی گەش و ئاڵ، بلبل کەوتە ناڵەناڵ «هێمن»› ☰ سروصدا

**گاڵەوگێڤە** / gałe w gîve/: ناو. هەڕەشە؛ کار و ڕەوتی ترساندن ☰ تهدید

**گاڵین**[1] / gałîn/: چاوگ. ۱. گۆرانی گوتن ۲. ناڵاندن ☰ ۱. آواز خواندن ۲. نالیدن

**گاڵین**[2]: ناو. گاڵینه؛ نانی هەرزن ☰ نان ارزن

**گاڵینه** / gałîne/: ☜ **گاڵین**[2]

**گام** / gam/: ناو. ۱. جەنجەڕ؛ چەوو؛ مۆشەن ۲. کات؛ وەخت ۳. هەنگاو ٤. ☜ **گاف ـ۲** ☰ ۱. خرمنکوب ۲. وقت؛ زمان ۳. قدم؛ گام ۴. ☜ **گاف ـ۲**

**گاما** / gama/: ناو. ۱. سێهەمین پیتی ئەلفوبێی یوونانی (γ) ۲. یەک له ملیۆن ۳. یەکەی تەوژمی میگناتیسی ٤. تیشکی ئەلکترومیگناتیسی بەرهەمی ناوکەی ئەتوم ☰ ۱تا۴. گاما

**گامارولە** / gamarule/: ☜ **گامارۆ**

**گامارۆ** / gamaro/: ناو. گامارولە؛ گامارۆلە؛ گامارۆڵە؛ ڕەش‌بەشە؛ مریشکەڕەشە ☰ چنگر

**گامارۆلە** / gamarole/: ☜ **گامارۆ**

**گامارۆڵە** / gamarołe/: ☜ **گامارۆ**

**گاماسی** / gamasî/: ناو. باقۆ؛ نەقە؛ جۆرێ ماسی ☰ نوعی ماهی

**گام‌گلۆس** / gamg(i)los/: ☜ **گوخلێنکە**

**گامل**[١] / gamil/: ناو. کاری شـان دانـە بـەر شـتی قورس ‹وە گامل تلاندی و بردی› ☰ عمل بـا فشـار شانە جسم سنگین را تکان دادن

**گامل**[٢]: ئاوەڵناو. *[پلار]* مـل‌پـان؛ ئەستۆئەسـتوور ☰ گردن‌کلفت

**گاموسەعەتی** / gamuse'etî/: ئاوەڵکار. هەر لەجێ؛ هەر ئێستا ☰ هم‌اکنون

**گاموش** / gamûş/: ☜ **گامێش**

**گامولە** / gamûle/: ☜ **گاولکێ**

**گامە** / game/: ناو. ١. کات؛ وەخت ٢. هـەنگاو ☰ ١. وقت؛ زمان ٢. گام؛ قدم

**گامەرز** / gamerz/: نـاو. هۆگـان؛ سـەرەگاوخان؛ شوێنی گەڕانەوەی هێڵی جووت ☰ محل دور زدن در شخم

**گامەلاس** / gameɫas/: نـاو. ١. ڕەوتی لـە کـار غەزرین و خەوتنی گا لە جووتـدا ٢. گاڵـتەیەکی زارۆکانە ☰ ١. امتناع گاو از شخم‌زدن ٢. نوعی بازی کودکان

**گامیت** / gamît/: ناو. گانە؛ توخمی جینسی ☰ گانه

**گامیش** / gamîş/: ☜ **گامێش**

**گامیناناوەر** / gamîna'awer/: ئاوەڵکار. پـێش‌تـر؛ سەردەمی پێشوو ☰ پیش از این

**گامێ** / gamê/: ئاوەڵکار. تاوێک؛ کەمێک لە وەخت ☰ لختی از زمان

**گامێزڕێگە** / gamêzřêge/: نـاو. *[کنایە]* زیگـزاگ؛ لابەلا؛ لاپلا؛ ڕێگای پێچەڵپێچ ☰ راه زیگزاگ

**گامێش** / gamêş/: ناو. گامووش؛ گۆمێش؛ گامیش؛ مەدەک؛ ماداک؛ مـادەک؛ کرتـان؛ چوارپـەلێکی شاخ ئەستووری زەلامە لـە تـیرەی چـێڵ بـەلام زلتر ☰ گاومیش

**گان**[١] / gan/: چاوگ. تێـەر. //گـات؛ دەگێـی؛ بگـێ// *[شـوورەیی]* گایین؛ گاین؛ گـای؛ ئیلاقـە کـردن ☰ گاییدن؛ گادن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەگان

**گـان**[٢]: نـاو. ١. *[شـوورەیی]* کـاری ئیلاقـە کـردن ٢. گیان؛ ژیان ٣. ☜ **گوان**[٢] ٤. گـەن؛ باڵاپۆشـێک بە قوماشی ئاونەدەر کە لە شوێنی دژگەنی‌کراودا لە بەری دەکەن (وەک ژووری نەشتەرگەری) ☰ ١. نزدیکی؛ جماع ٢. جان ٣. ☜ **گوان**[٢] ۴. گان

▣ **گان دان**: *[شوورەیی]* نێر لە خۆ جووت کـردن ☰ مفعول واقع شدن

**گان دایش** ١. *[شـوورەیی]* ئیلاقـەکران؛ بـەرکاری گان بوون ٢. گـان قـەتش؛ گیـان دەرچـوون؛ مردن ☰ ١. مفعول شدن ٢. مُردن

**گان قەتش** گان دایش؛ گیان دەرچوون؛ مـردن ☰ مُردن

**گان کردن** *[شوورەیی]* ئیلاقە کردن؛ ئـەنجامدانی گان ☰ جماع کردن

**ـ گـان**[٣]: پاشگر. ـــەکان؛ ـەگان؛ لـە بـری گـەلی ناسراوەوە ‹گاگان بفرووشین هەر وە چانەوە/ بنینەی ئـۆغر کالـێ گیانـەوە «فولکلـۆر»› ☰ نشـان جمـع معرفەساز (حرف تعریف)

**گانـاور**[١] / ganawir/: نـاو. گیانــەوەر؛ جانــەوەر ☰ جانور

**گاناور**[٢]: ئاوەڵناو. *[کنایە]* زاڵمی بێبەزەیی ☰ ظالم شقی

**گانـاوی** / ganawî/: ئاوەڵـناو. *[شـوورەیی]* زۆر بـــە ئالۆش؛ ئیشتیا لە گان ☰ شهوانی

**گانبۆگان** / ganbogan/: ئاوەڵـناو. *[شـوورەیی]* تـەواو ساغ و بەکەیف ☰ سالم و سرحال

**گانـــدایش** / gandayş/: ئاوەڵـــناو. لاوازی لـــــە کارکەوتوو ☰ لاغرمُردنی

**گاندە** / gande/: ☜ **گاندەر**

**گاندەر** / gander/: ناو/ ئاوەڵناو. *[شوورەیی]* گاندە: ١. جندە؛ قەحبە ٢. کوونی؛ بەپشت ☰ ١. فاحشـە ٢.

کونی

**گاندیل**[1] / gandîl/: ناو. *[کینایە]* مانگا ≥ مادە گاو

**گاندیل**[2]: ئاوەڵناو. گوان گەورە ≥ بزرگ‌پستان

**گاندێ کەوتش** / gandê kewtiş/: ئاوەڵناو. جاڕز لە گیان؛ وەڕەز لە ژیان ≥ سیر شدە از جان

**گانفیدا** / ganfîda/: ☜ **گیان‌فیدا**

**گانکەر** / ganker/: ناو / ئاوەڵناو. *[شووورەیی]* ئیلاقەکەر ≥ جماع کنندە

**گانگاز** / gangaz/: ئاوەڵناو. هاسان؛ دژی دژوار ≥ آسان

**گانگانۆکە** / ganganoke/: ☜ **گان‌گانۆکێ**

**گان‌گانۆکێ** / ganganokê/: ناو. *[شووورەیی]* گان‌گانۆکە؛ سەربەسەر؛ گانی یەکتر بە دەستەواو ≥ عمل گاییدن یکدیگر

**گانگلۆ** / gang(i)lo/: ☜ **گاوڵکێ**

**گانگیر** / gangîr/: ئاوەڵناو. تەمەڵ؛ تەپ؛ لەش‌گران ≥ تنبل

**گانوگۆشت** / ganugoşt/: ئاوەڵناو. *[پلار]* ١. قەڵەو؛ گۆشتن ٢. زەلام و ئەستور ≥ ١. چاق ٢. گُندە

**گانوەش** / ganweş/: ئاوەڵناو. سلامەت؛ لەش‌ساغ ≥ سالم

**گانە**[1] / gane/: ناو. گامیت؛ توخمی جینسی ≥ گانە

**ـ گانە**[2]: پاشگر. ـ انە ‹جیاگانە› ≥ ـ گانە

**گانەک** / ganek/: ئاوەڵناو. *[شووورەیی]* حەشەری؛ زەنەک؛ زۆر تامەزرۆی سەرجێیی (پیاو) ≥ شهوانی

**گانەکی** / ganekî/: ئاوەڵناو. *[شووورەیی]* حەشەری؛ زۆر بە ئیشتیای سەرجێیی (ژن) ≥ شهوانی

**گانەگۆڵ** / ganegoł/: ناو. *[شووورەیی، پلار]* کێشە و هەرا و زەنا ـ زەنا ≥ همهمە و شلوغی

**گانی** / ganî/: ناو. زیندوو؛ گیاندار ≥ زندە

**گانی‌گانی** / ganîganî/: ئاوەڵناو. ساغ و سەلامەت؛ ساق و سەلیم ≥ زندە و سرحال

**گاو**[1] / gaw/: ناو. ١. گا؛ نێری چێڵ ٢. گا؛ گاف؛ دەم ٣. کاری پینە کردنی زۆر قایم (وەک: چینی شکاو بە تێل و ...) ٤. تەقەڵ؛ کۆک ٥. پێنگاو؛ هەنگاو ≥ ١. گاو ٢. گاه ٣. کار بند زدن (چینی شکستە و ...) ٤. بخیە ٥. گام

⊡ **گاو دان**: ☜ **گاو کردن**

**گاو کردن/ کردنەوە**: گاو دان؛ گاوی دان؛ پینە کردن بە تێل ‹وات شکاند و خستتە بەر پێتەوە/ ئەستەمە پێم، تازە گاو بکرێتەوە «هێمن»› ≥ بند زدن

**ـ گاو**[2]: پاشوشە. *[ناشیرین]* ـ گا؛ گایاو؛ گاییو؛ گایاگ ‹کەران باوگاو› ≥ گاییدە

**گاوا** / gawa/: ئاوەڵکار. ١. گاڤا؛ چەلێ؛ کاتێ ٢. وابزانە؛ وادیارە ≥ ١. هنگامی ٢. انگار

**گاوابنە** / gawab(i)ne/: ☜ **گابنە**

**گاوار** / gawar/: ☜ **گابار**

**گاوارە** / gaware/: ناو. بێشکە؛ دەیدیک؛ دەرگووش ≥ گهوارە

**گاواسن** / gawasin/: ناو. گاسن؛ گیسن؛ گێسن؛ گاوەسن؛ گاوەسنگ؛ گاوەسەنگ؛ ئاسنی نووک‌تیژ کە لە دەندەی ئاموور دەخرێ و زەوی پێ دەکێڵن ≥ گاوآهن

**گاوان** / gawan/: ناو. گاچەڕێن؛ گاچێڕ؛ گادێڕ؛ گالوو؛ گاوۆ؛ گاوۆن؛ گاڤان؛ شوانی گاگەل ‹گاوان تا دانیشێ گاڕانی دوور ئەکەوێتەوە «مەسەل»› ≥ گاوچران

**گاوانە** / gawane/: ناو. دەفری گادۆشکە لە سواڵەت ≥ ظرف سفالین گاودوشی

**گاوانی** / gawanî/: ناو. گاڤانی: ١. کاری گاوان ٢. شەرتەشوانی گاوان ٣. سێروو؛ ڕیشۆڵێ ٤. دوامین کەسی ڕیزی هەڵپەڕکێ ‹دەچمە گاوانی› ≥ ١. گاوچرانی ٢. مُزد گاوچرانی ٣. سار ٤. نفر آخر

صف در حلقەی رقص

**گاوبەن** / gawben/: ☜ **گاوبەند**

**گاوبەنـد** / gawbend/: نـاو. گاوبـــەن؛ شـــوێنی بەستنەوەی ڕەشەوڵاخ لە تەویلە ☰ محـل بسـتن گاو در طویله

**گاوخان** / gawxan/: ناو. گاوەخـان؛ گـاوخوان: ١. شـوێنی تەختـە کـردنی زەمـین بـۆ کـێلان ٢. شوێنی هەو کردن و گەڕاندنـەوەی گـاجووت ٣. پێوانەیەک بۆ زەوی ‹ئەو دەیمە هەر دوو گاوخانـە› ☰ ١. شیار مرزی زمینی که شـخم مـی‌زننـد ٢. مـرز زمین شخم‌زده ٣. مقیاسی برای مساحت زمین

**گاوخوان** / gawxwan/: ☜ **گاوخان**

**گاود** / gawd/: ناوەڵناو. قووڵ؛ کووڕ ☰ ژرف؛ گود

**گاودانە** / gawdane/: ☜ **گاینە**

**گاودومە** / gawdume/: ناو. گیایەکـە بنەکـەی بـۆ ئێزنگ دەبێ ☰ گیاهی که ریشه‌اش به عنوان هیزم به کار می‌رود

**گاودۆڵ** / gawdoł/: نـاو. کۆل و بیر ☰ آبشـخور دام که از چوب یا فلز می‌سازند

**گـاور** / gawir/: ناو. گاڤر؛ گەبر: ١. فەلە؛ مەسیحی ‹شێخی سەنعان بۆ کچێ گاور لـە ئیسـلام وەرگـەڕا/ مـن خـەریکم بـۆ کچەشـێخێ پـەژیوان ببمـەوە! «هـێمن»› ٢. زەردەشـتی ٣. خوانـەناس ☰ ١. مسیحی ٢. گبر؛ زرتشتی ٣. کافر

**گاورمە** / gawirme/: نـاو. کـەرکۆل؛ گیایەکـە ☰ گیاهی است

**گاوزالک** / gawzalik/: ☜ **گوخلێتکە**

**گاوزبان** / gawz(i)ban/: ☜ **گادەمە**

**گاوزمان** / gawz(i)man/: ☜ **گادەمە**

**گاوزوان** / gawz(i)wan/: ☜ **گادەمە**

**گـاوس** / gawis/: ناو. گـاوەس؛ گاوەسـن؛ پێسـتی دەرهاتووی چێل کە دەکرێتە مەشـکە ‹ئاهـەنگی بەزم و شادی بوو، بەیانی کە تێکەڵ دەبوو/ شمشالی من، خرمـەی بـازن، گـرموهـۆڕی مەشـکەی گـاوس «هێمن»› ☰ پوست گاو که از آن مشک سازند

**گاوسنۆق** / gaws(i)noq/: ☜ **گاسنووق**

**گاوسو** / gawsû/: ناو. پشتێری گاگەل ☰ طویله‌ی گاوها

**گاوسەر** / gawser/: ناو. گاوەسـەر؛ کۆپـاری سـەر ئەستووری بە بزمار ‹دەست دا وە گۆپاڵ توهمتـەن دەستوور/ گاوسەر نە مشت وە چنگاڵ زوور «*شانامەی کوردی، هەورامی*»› ☰ چُماق سرگنده‌ی میخکوب

▣ **گاوسەر کردن**: *[کینایە]* زۆر پیس تەمێ کـردن ☰ سخت تنبیه کردن

**گاوشە** / gawşe/: ناو. جەڕەزەلام؛ دەفـری زل لـە سواڵەت بۆ ئاو تێکردن ☰ سبوی بزرگ

**گاوک** / gawik/: ناو. مێشوولەی تەپۆ ☰ نوعی پشه

**گاوکنـاس** / gawiknas/: نـاو. گاوەنـاز؛ نەخۆشـی ئەستۆ ئەستوور بوونی گاگەل ☰ بیماری ورم گلوی دام

**گاوکەر** / gawker/: ناو. گەوکەر؛ چیلانگەر؛ کەسێ کـە لـەتوکـوتی دەفـری شـکاوی چـینی دەلکێنێتەوە ☰ چینی‌بندزن

**گاوگوێر** / gawg(i)wêr/: ☜ **گاوگۆل**

**گـاوگۆل** / ga w gol/: ناو. گـاوگوێر؛ ڕەشـەوڵاخ ☰ چارپا؛ دام درشت

**گاوگەردون** / ga w gerdûn/: ناو. ١. برجی گـا لـە عاسمان ٢. کاری سەر برینی ئاژەڵ بۆ پێشـوازی لە مرۆی بەقەدر و حورمـەت ‹یـاخوا بـەخێر بـێن، دەبوو گاوگـەردوونتان بـۆ بکـەم› ☰ ١. بـرج ثـور ٢. قربانی به یمن قدوم بزرگان

**گاولکە** / gawiłke/: ☜ **گاولکێ**

**گـاولکێ** / gawiłkê/: نـاو. گاگۆلـکە؛ گاگۆلـکێ؛ گاگۆلە؛ گامووله؛ گانگلۆ؛ گاولکە؛ کاری ڕۆیشـتن لە سەر دوو دەست و دوو ئەژنۆ ☰ چهار دست و پا (راه رفتن)

**گاون** / gawin/: ☜ **گەون**

**گاوومە** / gawume/: ☜ **گۆگەم**

**گاوۆ** / gawo/: ☜ **گاوان**

**گاوۆن** / gawon/: ☜ **گاوان**

**گاوە** / gawe/: ناو. گۆوە؛ هۆرە؛ پواز ≡ گوه

**گاوەخان** / gawexan/: ناو. ١. ☜ **گاوخان** ٢. بەشی ڕۆژەجووتێ لە زەوین ٣. تەویلەی گاگەل ≡ ١. ☜ **گاوخان** ٢. زمین کافی برای یک روز شخم ٣. طویلەی گاوها

**گاوەخت** / gawext/: ناوەلکار. جارناجار؛ کاتی وا؛ برێ جار ‹گاوەخت ئێمە ئەچین› ≡ گاهی؛ بعضی اوقات

**گاوەر** / gawer/: ناو. گەماڵ؛ قەپەگۆڵ؛ نێرەسەگی زل ≡ سگ نر گُندە

**گاوەزوان** / gawez(i)wan/: ☜ **گوڵگاوزوان**

**گاوەس** / gawes/: ☜ **گاوس**

**گاوەسپۆک** / gawespok/: ناو. گیایەکە بنەکەی دەخورێ ≡ گیاهی با پیاز خوردنی

**گاوەسن** / gawesin/: ناو. ١. ☜ **گاوس** ٢. ☜ **گاواسن**

**گاوەسنگ** / gawesing/: ☜ **گاواسن**

**گاوەسەر** / gaweser/: ☜ **گاوسەر**

**گاوەسەنگ** / gaweseng/: ☜ **گاواسن**

**گاوەشە** / gaweşe/: ☜ **گادۆش ـ١**

**گاوەک** / gawek/: ناو. ١. کەوگی؛ مچی؛ گەنە؛ گاوەناز؛ گەنەکەولە ٢. قەوزە؛ قۆزەقورواق؛ کەز؛ جۆلە ≡ ١. کنە ٢. خزە؛ جلوزغ

**گاوەکی** / gawekî/: ناوەلناو. وەک گا؛ گائاسایی ≡ گاومانند

**گاوەناز** / gawenaz/: ناو. ١. ☜ **گاوەك ـ١** ٢. ☜ **گابنێسك**

**گاوی** / gawi/: ناو. کاری بەستن ≡ عمل بستن

⊡ **گاوی دان**: گاو دان؛ شەتەک دان؛ توند پێچاندنەوە و جوولە لێ برین ‹وەها گەی لەشی بەو گە بەردینە گاوی دراوە/ کەحێلێکە، کۆرژن و حیلەی نەماوە! «سوارە»› ≡ مُحکم بستن

**گاویلکە** / gawîlke/: ناو. ١. ☜ **کلكهەڵتەکێنە** ٢. ئێستر؛ دایک کەری بارگین باب ≡ ١. ☜ **کلكهەڵتەکێنە** ٢. قاطر

**گاه** / gah/: ناوەلکار. *[ئەدەب]* گا؛ جار؛ دەم ‹تۆ تراوکەی جارێ دیار، گاهێ نەدیاری/ هیوای تینوێتی ڕێبواری «سوارە»› ≡ گاه

**گاهس** / gahis/: ☜ **گاهەس**

**گاهۆڵە** / gahołe/: ☜ **گاگێرە ـ١**

**گاهەز** / gahez/: ☜ **گاهەس**

**گاهەزی** / gahezî/: ☜ **گاهەسی**

**گاهەس** / gahes/: ناوەلکار. گاهەز؛ گاهس: ١. جاری وایە ٢. ڕەنگە؛ وێدەچێ ≡ ١. گاهی؛ گاه باشد ٢. شاید

**گاهەسی** / gahesî/: ناو. گاهەزی؛ ئەگەری؛ ئیحتیمال ≡ احتمال

**گاهێ** / gahê/: ناوەلکار. برێجار؛ جاروبار؛ جارنەجار ≡ گاهی

**گای** / gay/: چاوگ. *[شووروەیی]* گایین ≡ گاییدن

**گایار** / gayar/: ناو. جووت؛ شێو؛ شۆ؛ شێف ≡ شُخم

**گایاری** / gayarî/: ناو. جووتکاری؛ کاری زەوی کێلان ≡ عمل شخم زدن

**گایاگ** / gayag/: ☜ **گایاو**

**گایان** / gayan/: ☜ **گایران**

**گایانە** / gayane/: ☜ **گاینە**

**گایاو** / gayaw/: ناوەلناو. *[شووروەیی]* گایاگ؛ پێوە کراو؛ تێنراو ≡ گاییدە شدە

**گایران** / gayran/: چاوگ. تێنەپەر. نادیار. //گایرای؛ دەگایرێ؛ بگایرێ// گایان؛ تێ نران ≡ گاییدە شُدن

■ ناوەلناوی بەرکاری: گایراو/ چاوگی نەرێنی:

نەگایران

**گایلکە / gayilke/**: ناو. ١. ئێستری چکۆلە ٢. ☜ کلکهەڵتەکێنە ≡ ١. استر ریز اندام ٢. ☜ کلکهەڵتەکێنە

**گاین / gayin/**: ☜ گان[1]

**گاینجە / gayince/**: ناو. سەرمژانە؛ دارێکی کورتە لە نێوان نیر و ئامووردا ≡ چوبک رابط خیش و یوغ

**گاینە / gayne/**: ناو. گادانە؛ گاودانە؛ گایانە؛ گایێنە؛ گلێنە؛ مچ؛ کزن؛ کلێنە؛ زنگزاوا؛ هورتومان؛ جیدانە؛ کرسنە: ١. گیایەکی تایبەتی ناوچەی مامناوەندی، بە گوڵی بچووک و دەنکی تۆکڵدارەوە کە بۆ ئالیک چاکە ٢. دانەی ئەو گیایە کە ورد و قاوەییە ≡ ١و٢. گاودانە

**گایە / gaye/**: ☜ گایێڵ ـ١

**گایەر / gayer/**: ناو/ ناوەڵناو. *[شووریی]* ئیلاقەکەر؛ گانکەر ≡ فاعل جماع

**گایەل / gayel/**: ناو. گائەل؛ گاگەل ‹ئێوارە وەختێ گایەل ئەخرۆشێ/ سەوزەی قەدباریک مێخەک ئەفرۆشێ «فولکلۆر»› ≡ رمەی گاو؛ گلەی گاو

**گایەلەوان / gayelewan/**: ناو. گالەوان؛ گاگەلەوان ≡ گاوچران

**گایین / gayîn/**: ☜ گان[1]

**گایێنە / gayêne/**: ☜ گاینە

**گبر / gibr, gibir/**: ناوەڵناو. زۆرتەریقەوە بوو؛ لە شەرمان سوورهەڵگەڕاو ≡ شرمسار

**گبریتی / gibrîtî/**: ناو. تەریقی؛ شەرمەزاری؛ فەدیکاری ≡ شرمساری

**گبیسە / gibîse/**: ناو. کەبیسە ≡ کبیسە

**گپ / gip/**: ناو. ١. ☜ گوپ ـ١ ٢. قسە؛ وشە ≡ ١. ☜ گوپ ـ١ ٢. گفت؛ سُخن

**گت[1] / git/**: ناو. وچان؛ ئوقرە ‹گتێکی کرد و دیسان درێژەی بە قسەکانی دا› ≡ وقفە

⊡ **گت تێکەوتن**: قەت بوون؛ لە گەڕان کەوتن ‹ئەگەر گتی تێ نەکەوێ، کارەکە بەهار تەواو دەبێ› ≡ دچار وقفە شدن

**گت کردن**: ١. وەستان؛ وەستانەوە ٢. بڕان و پچڕانی ڕەوتانەیەک ≡ ١. توقف کردن ٢. قطع شدن فرایندی

**گت[2]**: ناوەڵناو. ١. قیت؛ زۆپ ٢. سفت؛ تۆکمە؛ ڕەقی یەکپارچە ٣. *[پلار]* زل؛ زەلام ≡ ١. برجستە؛ برآمدە ٢. صُلب ٣. گُندە

**گتایی / g(i)tayî/**: ناو. زەقایی؛ قیتی ≡ برجستگی

**گتن / gitin/**: ناوەڵناو. تایبەتمەندی گیانداری وا لە ڕۆیشتندا جاروبار گت دەکا ≡ ویژگی جانداری کە در حرکت، توقف‌های متناوب دارد

**گتوڕ / g(i)tuř/**: ☜ گوندوڕ

**گتە / g(i)te/**: ناوەڵناو. گت: ١. *[پلار]* زلە؛ زەلام ٢. زەقی لە دوور دیار ≡ ١. گُندە ٢. برجستەی از دور نمایان

**گتەکوچک / g(i)tekuçk/**: ناو. گاشەبەرد؛ تەلەسەنگ ≡ سنگ بزرگ

**گجک / gicik/**: ناو. ١. ☜ گجی ـ١ ٢. نێرگزەی چێڵ ٣. کەزی؛ پرچ ≡ ١. ☜ گجی ـ١ ٢. برجستگی شرمگاه ماده گاو ٣. گیسو

**گجگج / gicgic/**: ناو. ڕەوتی ڕاوەشانی دار؛ لەرزینی دار ≡ حالت تکان خوردن درخت

**گجگجاندن / gicg(i)candin/**: چاوگ. ڕاوەشاندن؛ لەرانەوە ≡ تکان دادن

**گجوک / g(i)cûk/**: ناو. گوجووک؛ گوجی؛ تووتکەسەگ؛ تووتەڵەسەگ ≡ تولەسگ

**گجول / g(i)cûl/**: ناو. گوجیلە؛ تووتکەسەگی بچکۆلانە ≡ تولەسگ نوزاد

**گجە / g(i)ce/**: ناو. ڕایەت؛ ڕەعیەت؛ دێنشین ≡ رعیّت

**گجی / g(i)cî/**: ناو. ١. گجک؛ کراس؛ کەراس ٢. *[پلار]* ئاڵۆش؛ ئیشتیای سەرجێیی کردن (ژن) ≡

١. پیراهن ٢. آرزوی جماع (زن)

⊡ **گجی بون:** ئالۆش بوون؛ بە ئالۆش بوون (ژن) ≣ آرزوی جماع داشتن (زن)

**گج** / giç/: ناو. گرێ؛ لک؛ لکە ≣ گره درخت

**گچچە** / giççe/: دەنگ. گچە؛ وەحە؛ وشەی دەنگدانی گاوگوێل ≣ کلمەی راندن گاو

**گچک** / giçik/: ☜ **گچکە**[1]

**گچکۆ** / giçko/: ☜ **گچکە**[1]

**گچکۆکە** / giçkoke/: ☜ **گچکە**[1]

**گچکۆڵە** / giçkołe/: ئاوەڵناو. گچکەڵە؛ بچکۆلانە ≣ کوچولو

**گچکە**[1] / giçke/: ئاوەڵناو. گچک؛ گچکۆ؛ گچکۆکە؛ چکۆڵە؛ بووچک ‹مندالی گچکە› ≣ کوچک

**ـ گچکە**[2]: پاشەوشە. گچک؛ بووچک؛ چکۆڵە ‹براگچکە› ≣ کوچک

**گچکەڵە** / giçkełe/: ☜ **گچکۆڵە**

**گچکەیی** / giçkeyî/: ناو. بووچکی؛ وردی ≣ کوچکی

**گچە**[1] / g(i)çe/: ناو. ١. ☜ **گوێرەکە** ٢. چەنە؛ چەناگە؛ ئەرزینگ ≣ ١. ☜ **گوێرەکە** ٢. چانه

**گچە**[2]: ☜ **گچچە**

**گدا** / g(i)da/: ☜ **گەدا**

**گدۆک** / g(i)dok/: ناو. گرد؛ تەپۆلکە؛ تەپەی پچووک ≣ تپەی کوچک

**گدۆڵ** / g(i)doł/: ☜ **گەڕکە**

**گدو** / g(i)dû/: ناو. تەپە؛ کێوی چکۆڵە ≣ تپه

**گدە**[1] / g(i)de/: ناو. گدێ: ١. بزن ٢. کارژیلە ≣ ١. بُز ٢. بُزغاله

**گدە**[2]: دەنگ. گدێ؛ هەرا لە بزن ≣ کلمەی راندن بُز

**گدی**[1] / g(i)dî/: ئاوەڵناو. ١. چارەڕەش؛ بەدبەخت ٢. بێئابڕوو؛ ئابڕووتکاو ≣ ١. بیچاره؛ سیاه‌بخت ٢. بی‌آبرو

**گدی**[2]: جێناو. فلان کەسی خۆشەویستم ≣ فلان دوستم

**گدی**[3]: دەنگ. وشەی بانگ کردنی کارژیلە و بزن ≣ کلمەی فراخواندن بز و بزغاله

**گدی**[4]: سارستە. هۆی کاورا ≣ های؛ حرف ندا

**گدیانۆ** / gidyano/: سارستە. ١. هۆی خۆشەویستی دوور (لە سەربەندی لاوکاندا دەیڵێن) ٢. گەلۆ؛ خەڵکینە ≣ ١. ای یار دور از من ٢. آی آدم‌ها

**گدیش** / g(i)dîş/: ناو. خۆیان؛ کلۆشی گێرەکراوی خڕەوەبووی شەنەنەکراو ≣ کسته

**گدینۆ** / g(i)dîno/: سارستە. ١. خەڵکینە؛ گەلۆ ٢. هۆی فلانکەس ≣ ١. ای مردم ٢. های؛ حرف ندا

**گدێ** / g(i)dê/: ☜ **گدە**

**گدێش** / g(i)dêş/: ☜ **گواندێن ـ١**

**گدێو** / g(i)dêw/: ناو. هەتیو؛ بابمردوو ≣ یتیم

**گر**[1] / gir/: ناو. ١. تەپە؛ گدوو؛ کێوی چکۆڵە ٢. فێڵ؛ فریو؛ گزی ٣. گونک؛ ئەنگوتکی هەویر ٤. قسەی نامەقوول و نە جێی باوەڕ ٥. *[مەجاز]* بنیادەمی پایەبەرز ≣ ١. تپه ٢. فریب ٣. چونەی خمیر ۴. سخن مُبالغه‌آمیز ۵. آدم بزرگمنش

⊡ **گر کرن:** پف کردن ≣ مُبالغه کردن

**گر**[2]: ئاوەڵناو. ١. خڕ؛ وەک تۆپ ٢. درشت؛ گەورە ≣ ١. گرد؛ مُدور ٢. دُرُشت

⊡ **گر بون:** هەراش بوون؛ باش خۆ گرتن و بە خۆدا هاتن ≣ ریشه دواندن و نمو کردن

**ـ گر**[3]: پاشەوشە. ١. بەند ‹پاشگر؛ پێشگر؛ دەسگر› ٢. داگیرکەر ‹دنیاگر› ٣. گیر؛ لە بەر شتێکەوە ‹باگر› ٤. بگر؛ ڕاوکەر ‹ماسیگر› ٥. ڕاکێشەر ‹دلگر؛ چاوگر› ٦. گیر ‹قەپگر› ٧. جێگە و شوێن؛ قەرار ‹ورچگر؛ میوانگر› ٨. خایەن ‹زۆرگر؛ کاتگر› ≣ ١. ـ وند ٢تا۶ ـگیر ٧. ـ پذیر ٨ ـ بر

**گر**[4]: پێشوشە. گرە؛ گەورە ‹گرگرە؛ گرمیر› ≣ بزرگ

**گرار** / g(i)rar/: ناو. دانەوێڵەی چێشتی توند؛

(بریتی لە برنج و ساوار و گەنم کە بە پلاو لێبندرێن)
≡ حبوبات آشی (مانند: برنج و گندم و بلغور)

**گراز** / g(i)raz/: ناو. شلەبرنج؛ شـلەبروێش ≡ آش بلغور

**گرازنای** / g(i)raznay/: چاوگ. هاتنە گارەگـار ≡ کراخیدن

**گراس** / g(i)ras/: ناو. چـەرس؛ مـاکی سـڕکەری وەبەرهاتوو لە شادانە ≡ چرس

**گرافیت** / g(i)rafît/: ناو. جۆرێک بلۆری سروشـتی کەربون، ڕەش، چەور، نـەرم و بریکـەدار کـە لـە تینی زۆردا ناتوێتەوە، درەنگ دەسـووتێ، کارەبـا باش ڕادەگوزێ و لە سـەر کاغـەز شـوێنی ڕەش دەخـا و لـە دروسـتکـردنی میـداد و موتـوری کارەبادا بە کەڵک دێ ≡ گرافیت

**گرافیست** / g(i)rafîst/: ناو. کەسێ کـە بـە هـێڵ و نووسراوە نەخش و نیگار بەدی دێنێ ≡ گرافیست

**گرافیک** / g(i)rafîk/: ناو. هونەری کێشانی هـێڵ و نووسـراوە و نەخشـاندنی لـە سـەر شـتێک بـۆ ڕاگەیاندنی پەیامێکی تایبەت ≡ گرافیک

**گراڤ** / g(i)rav/: ناو. ١. ئاد؛ چزیرگە ٢. زەلکاو ≡ ١. جزیره ٢. باتلاق

**گراڤە** / g(i)rave/: ناو. نیودوڕگە؛ نیمچە جزیرگـە ≡ شبەجزیره

**گراگر** / g(i)ragir/: ئاوەڵناو. جێبەرز و بەحورمەت ≡ بلندپایە

**گراڵک** / g(i)rałik/: ☜ **گرالك**

**گرام** / g(i)ram/: نـاو. ١. ☜ **گرامافۆن** ٢. گـرەم؛ هەزاریەکی کیلۆ ≡ ١. ☜ **گرامافۆن** ٢. گرم

**گرامافون** / g(i)ramafun/: ☜ **گرامافۆن**

**گرامافۆن** / g(i)ramafon/: نـاو. گـرام؛ گرامـافون؛ گرامەفون؛ قەوان؛ قەوانە؛ سنۆق‌ئاوازە؛ سـندووق؛ بێـژەک؛ سـندووقی سـترانان؛ دەزگایـەک بـۆ بیستنی دەنگی تۆمارکراو لە سەر پەڕەی لە قـیر چێ کراو ≡ گرامافون

**گرامەفون** / g(i)ramefun/: ☜ **گرامافۆن**

**گرامەفۆن** / g(i)ramefon/: نـاو. بێـژەک؛ قـەوان؛ سندووقی ستران ≡ گرامافون

**گرامێر** / g(i)ramêr/: ناو. ڕێزمان ≡ گرامر

**گران**[1] / g(i)ran/: ☜ **گیران**

**گران**[2]: ئاوەڵناو. ١. سەنگین؛ قـورس ‹سـبەی کـابرا بوخچەیەکی گرانـی پێ بوو، شـەش کیلـۆ دەبـوو ... «هەژار، چێشـتی مجێـور»› ٢. گرانبـایی؛ نـرخ‌زۆر ‹گرانە، لە سەندن نایێ› ٣. سـەنگین؛ بەشـەرم و حـەیا و لەسـەرخۆ ٤. هێـژا؛ هـەژی؛ بایەخـدار ‹خزمـەت گـران و داوا هـەرزان! «مەسـەل»› ٥. تایبەتمەندی گوێ، کاتێک باش دەنـگ نابیسـێ ‹گوێم گرانە› ٦. چەتوون؛ ناخۆش ‹لە دلما خەم و داخی ئەم دەردە سەوزە/ کە دەردی گرانـی هـەموو ڕێبـواری وەنـەوزە «سـوارە»› ٧. توندوپـڕ ‹مژەکـە گرانـە› ٨. ڕەسـەن و نـەجیم ٩. ئەسـتەم؛ دژوار ‹دلداری و خۆر وەکوو برانە/ شێوانەوەیان گەلێ گرانە «هەژار، *مەم و زین*»› ≡ ١. سنگین ٢. گران‌قیمت ٣. باوقار ٤. ارزشمند (وزن) ٥. سنگین (گوش) ۶. سـخت؛ ناخوشایند ٧. فشرده و غلیظ ٨. اصیل ٩. دشوار

⊡ **گران بوون**: ١. گرانبایی بوون؛ بـەنرخ بـوون ٢. هەڵکشانی نرخ ٣. چـەتوون و دژوار بـوون ٤. قورس بوون ≡ ١. گران بودن ٢. گـران شـدن ٣. بحرانی بودن ٤. سنگین بودن

**گران دان**: بە نرخی زۆرەوە فرۆشتن. هـەروەها: **گران سەندن** ≡ گران فروختن

**گران کردن**: بردنە سەرەوەی نرخ ≡ گران کردن

**گران کەوتن**: ☜ **گران نیشتن**

**گران نیشتن**: گران کـەوتن؛ گـران هاتنـەوە: ١. خەرجی زۆر هەڵگرتن ‹ئـەم ماڵـە بۆمـان گـران نیشت› ٢. خراپ تەواو بـوون ‹ئـەم کـارە بـۆت گران ئەنیشێ› ≡ ١. گران درآمدن ٢. گران تمام

شدن

**گران هاتنەوە** ☜ **گران نیشتن**

**گران ـ٢**: پێشوشە. گر؛ گەورە؛ مەزن ‹گرانمیر؛ گرانجان› 🇮🇷 بزرگ

**ـ گران٤**: پاشوشە. ١. قورس؛ سەنگین ‹بارگران› ٢. نەچێ؛ ناحەز ‹ڕەزاگران› 🇮🇷 ١. سنگین ٢. نامطلوب

**گرانایی** /g(i)ranayî/: ناو. ١. قورسایی؛ سەنگینی ٢. دژواری؛ سەخڵەتی ‹پیاو کە گرانایی ژیانی لە سەرە و ... «هەژار، چێشتی مجێور»› 🇮🇷 ١. سنگینی ٢. سختی

**گرانبار** /g(i)ranbar/: ئاوەڵناو. ١. قەبە و قورس (ئەسپاباتی ماڵ) ٢. *[مەجاز]* تایبەتمەندی کەسێ خێزانی زۆرە و زەحمەتکێشە 🇮🇷 ١. اسباب و اثاثیه سنگین وزن ٢. عیالوار زحمتکش

**گرانبایی** /g(i)ranbayî/: ئاوەڵناو. گرانبەها؛ زۆر بەنرخ 🇮🇷 گرانبها

**گرانبەها** /g(i)ranbeha/: ☜ **گرانبایی**

**گرانتا** /g(i)ranta/: ☜ **گرانەتا**

**گرانجان** /g(i)rancan/: ئاوەڵناو. ١. زەڕەتاڵ؛ ڕەزاقورس؛ خوێنتاڵ ٢. پڕکێش؛ گرانفرۆش 🇮🇷 ١. گرانجان ٢. گرانفروش

**گرانقیمەت** /g(i)ranqîmet/: ئاوەڵناو. بوها؛ بایەخدار 🇮🇷 قیمتی

**گرانکێش** /g(i)rankêş/: ناو. ١. قەپان؛ باسکۆ ٢. سلینگ؛ جەڕیسەقیل 🇮🇷 ١. باسکول ٢. جرثقیل

**گرانمایە** /g(i)ranmaye/: ئاوەڵناو. ١. گرانبایی؛ بەپارەی زۆر کڕدراو ٢. *[کینایە]* بە هونەر و جەوهەر 🇮🇷 ١. گرانقیمت ٢. هُنرمند

**گرانمێر** /g(i)ranmêr/: ئاوەڵناو. خاوەنڕێز؛ بەحورمەت (پیاو) 🇮🇷 باوقار (مرد)

**گرانەتا** /g(i)raneta/: ناو. گرانتا؛ گرانەتێ؛ سووورەیاو؛ ڕەشگرانی؛ ڕەشەگرانەتا؛ ڕەشەگرانەتێ؛ ئێشاگران؛ تیفوید؛ پەتایەکی کۆئەندامی هەرسە، کە بە هۆی بەکتریای سالمۆنێلاوە لە ڕێگەی خواردن و خواردنەوەی ئاو و خۆراکی پیس دەگوازرێتەوە، دیارترین نیشانەکانی بریتییە لە: تای ٤١-٣٩ پلە، ژانەسەر، ئازاری ماسوولکەکان، سکچوون، لەرز و ... 🇮🇷 تیفوئید؛ حصبه

**گرانەتێ** /g(i)ranetê/: ☜ **گرانەتا**

**گرانی** /g(i)ranî/: ناو. ١. قورسی؛ سەنگینی؛ گرانایی ٢. سەختی؛ دژواری ٣. قاتی؛ قڕی؛ دۆخی دەست نەکەوتنی بژیو ‹ساڵی گرانییەکە نان دەست نەدەکەوت› ٤. دۆخی نرخ لە سەرەوە بوون و بەرەژوورتر چوون ٥. شەرم و پشوولەسەرخۆیی ٦. جۆرێ هەڵپەڕکێ 🇮🇷 ١. سنگینی ٢. سختی ٣. قحطی؛ تنگسالی ۴. گرانی ۵. وقار ۶. نوعی رقص گروهی

**گرانیت** /g(i)ranît/: ناو. پازار؛ بەردی خارا 🇮🇷 گرانیت

**گرانیگا** /g(i)ranîga/: ناو. قورساییگە؛ خاڵی قورسایی؛ جێ قورسایی؛ جەرگەی قورسایی؛ نێوڵ؛ نێوەڵ؛ سوون؛ خاڵێک لە سەر یان نێزیکی هەموو ماکێکدا کە هەرچی هێزی ڕاکێشی ڕوو دەکەنە ئەو ماکە، لەو خاڵەدا یەک دەگرنەوە 🇮🇷 گرانیگاه

**گرانیە** /g(i)ran(i)ye/: ناو. قورسایی لە کێشاندا 🇮🇷 سنگینی در توزین

**گرانێر** /g(i)ranêr/: ناو. قورس‌تر لە کێشانەدا 🇮🇷 طرف سنگینتر در توزین

**گراو١** /g(i)raw/: ناو. ١. دیل؛ ئێسیر ٢. بەندی؛ زیندانی ٣. بارمتە؛ گرەو 🇮🇷 ١. اسیر ٢. زندانی ٣. گروی

**گراو٢**: ئاوەڵناو. ١. دیل؛ ئێسیر ٢. بەندی؛ زیندانی ‹گراوی داوی کەزیانم/ بەیانت خۆش‌وگەش خانم/ وەرە ڕووناکی چاوانم/ ببینم بەژن‌وبالاکەت «هەژار،

شەرحی مەلای جزیری») ٣. داخراو؛ بەسراو ☰ ١. اسیر ٢. زندانی ٣. مسدود

**گراونای** /g(i)rawnay/: چاوگ. گریاندن؛ هێنانە گریانەوە ☰ گریاندن

**گراوە** /g(i)rawe/: ناو. ١. چزیر؛ دورگە؛ ئاد؛ جزیرە ٢. دینگی چەڵتووک کوتان ☰ ١. جزیرە ٢. دنگ شالیکوبی

**گراوی** /g(i)rawî/: ناو. دڵبەر؛ ماشقە؛ یاری مێوینە ‹دێم گراوی خۆم لە باوەش وەرگرم/ دێم نەهێڵم بەرهەڵست و بەرگرم «هێمن»› ☰ معشوقە

**گراویلکە** /g(i)rawîlke/: ☜ **گراویلکێ**

**گراویلکێ** /g(i)rawîlkê/: ناو. گراویلکە؛ دڵبەری جوان و ژیکەڵە ‹کوڕ دەڵێ: قەول‌وقەراری خۆم دەگەڵ گراویلکێ دەبەست، ئەوێ محەلی بەهارێ کە ماڵ پێ دەچوونە کوێستانێ «پایزە»› ☰ معشوقەی ناز و کوچولو

**گربەست** /girbest/: ناو. کار و ڕەوتی وەشارتن و لە پریسکەدا گڕێ دان ☰ عمل پنهان کردن

**گرپە** /girpe/: دەنگەناو. دەنگی پێ‌بوونی ئاگر ☰ صدای درگرفتن آتش

⊡ **گرپە کردن**: لەپڕ داگیرسان ☰ بە صورت ناگهانی و با صدا روشن شدن

**گرپێچ** /girpêç/: ☜ **گێژەڵوکە**

**گرت** /girt/: ناو. گر؛ گرد؛ گدوو؛ تەپۆلکە ☰ تپە

**گرتک** /girtik/: ناو. ١. تەپۆلکە؛ گدوو ٢. پێشەی لەش ‹پیاوێکی گرتک ئەستوورە› ٣. پارچە؛ تیکە؛ کوتە ‹**گرتکە** گۆشتێکی خستە بەری› ٤. پرێسکە؛ بوخچە ٥. ناوک؛ قووڵایی پچووکی دوڕ زگ ٦. ئەنگوتک؛ گونک ٧. شوێنی حەسانەوەی حەیوانی کێوی ☰ ١. تپەی کوچک ٢. استخوان‌بندی ٣. قطعە ۴. بُقچە ۵. ناف ۶. چونە؛ گلولەی خمیر ٧. جای استراحت حیوان کوهی

**گرتکە** /girt(i)ke/: ناو. ١. ئەنگوتک؛ گونک ٢. پارچەگۆشت ٣. شوێنێ کە زۆری حەیوانەکێوی لێیە ☰ ١. چونە ٢. تکەی گوشت ٣. جولانگاە حیوانات کوهی

**گرتکەگۆشت** /girt(i)kegoşt/: ناو. خرتک؛ پارچەی پرچنگ لە گۆشت ☰ قطعەگوشت

**گرتم** /girtim/: سارستە. گریمان؛ وامدانا ☰ فرض کە

**گرتمان** /girtman/: ناوەڵکار. مەگرتێ؛ گریمان؛ وامان دانا ☰ بە فرض

**گرتن** /girtin/: چاوگ. تێپەڕ. //گرتت؛ دەگرێ؛ بگرە// گردن: ١. خستنە ناو دەست ‹تۆپەکەم گرت› ٢. قۆڵبەست کردن؛ دیل کردن ‹چوار کەسیان گرت› ٣. بەند کردن؛ ڕاگرتن ‹ئەچییە ژێر ئاو، هەناسەت بگرە!› ٤. دانان؛ فەرز کردن ‹بگرە جارێ‌تریش هات› ٥. بە ڕۆژوو بوون ‹ئەم ڕەمەزانە هەمووم گرت› ٦. بەستنی کون و کەلێن و... ‹کونەکەم بە پەڕۆ گرت› ٧. قرتاندن ‹نینۆکم گرت› ٨. کوشین؛ گووشین ‹کەوشەکانم پام ئەگرێ› ٩. بەردەست کردن؛ هێنانە ژێر ڕکێفی خۆ ‹دوژمن قەڵاکەی گرت› ١٠. جێگیر بوون ‹بچن سەنگر بگرن!› ١١. جێ بوونەوە؛ دێران ‹ئەم جەواڵە شەش پووت زیاتر ناگرێ› ١٢. دەستەمۆ کردن (جوانووە ئەسپ و...) ١٣. بەر گرتن؛ میوە دان ‹ئەم دارە گوێزی باشی **گرتووە**› ١٤. تووش بوون؛ پێوە بوون؛ تووشیاری نەخۆشی و نەهامەتی بوون ‹جارێک کەوتووییم گرت و لە مردن گەڕامەوە «هێمن»› ١٥. بە کرێ گرتن ‹لە چوار باخ ماڵێکم گرت، ساڵێک لەوێ بووین› ١٦. گرتنە بەر؛ هەڵبژاردن ‹ئەم ڕێگە **بگرە** و بەری مەدە!› ١٧. بە دەست یان شتێک ڕاگرتن ‹بیگرە باوش! بەو مەقاشە بیگرە!› ١٨. دەست خستن ‹نۆرە گرتن› ١٩. ڕاو کردن ‹ماسی گرتن؛ چۆلەکە گرتن› ٢٠. گەزنگاز بوون ‹کارەبا (کەسێ) گرتن› ٢١.

هەڵس‌وکەوت کردن ‹سەخت گرتن؛ ئاسان گرتن› ٢٢. وەرگرتن؛ تێگەیین ‹قسەکەی منت گرت؟› ٢٣. خستنە ناو چوارچێوەی شتێک ‹گەچ گرتن؛ قاپ گرتن› ٢٤. دامەزراندن ‹کاریگەر گرتن› ٢٥. بە بارودۆخێکدا کەوتن ‹ئارام بگرە ئەی دڵ!› ٢٦. لێدان؛ پێکان ‹بەردێکم بۆی خست نەیگرت› ٢٧. بەرەو شوێنێک خستن ‹کەوا ئەو شۆخە تیرێکی بە عەمدەن گرتە من مەحوی/ ... «مەحوی»› 🕮 ١. گرفتن ٢. دستگیر کردن ٣. گرفتن ۴. انگاشتن؛ فرض کردن ۵. روزه گرفتن ۶. مسدود کردن سوراخ ۷. چیدن (ناخن و...) ۸. فشُردن ۹. گرفتن ۱۰. مُستقر شدن ۱۱. گنجایش داشتن ۱۲. رام کردن (کُرّه اسب و...) ۱۳. ثمر دادن ۱۴. مُبتلا شُدن ۱۵. اجاره کردن ۱۶. انتخاب کردن ۱۷. نگهداشتن ۱۸. گرفتن ۱۹. صید کردن ۲۰و۲۱. گرفتن ۲۲. فهمیدن ۲۳. گرفتن ۲۴. استخدام کردن ۲۵. گرفتن ۲۶. اصابت کردن ۲۷. انداختن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەگرتن

**گرتنەک** / girt(i)nek/: ناو. بەڵگەی حەساوکتاو 🕮 سند حساب‌وکتاب

**گرتنەوە** / girt(i)newe/: چاوگ. تێپەڕ. //گرتەوە؛ دەگرییەوە؛ بگرەوە// گردنەوە: ١. بەردە تەرازوو دروست کردن ٢. قۆزتنەوە لە حەوا ٣. تراو کردنەوە و لێکدان ‹دەرمانم بۆ دەگرێتەوە؛ خەنەم گرتەوە› ٤. هاتنەوە جێی ئەندامی لەجێ چووگ یان شکاو ‹مەچەکم لەجێ چوو، جەراح گرتییەوە› ٥. ڕوانین لە کتێب بۆ لە داهاتوو زانین ٦. فاڵ دیتنی فالگرەوە ٧. ڕاکردوو دەست خستنەوە ‹ئەسپەکە بەر ببوو، گرتمەوە› ٨. تووش بوونی نەخۆشی لە خەڵکەوە ‹ئەم نەخۆشییە گرتنەوەی هەیە، وریای منداڵەکان بە!› ٩. قەرەبوو کردنەوەی ڕۆژووی فەوتاو ‹دوو ڕۆژ ڕۆژووم فەوتا، پاشان گرتمەوە› ١٠. گەیشتن بەوەی پێش کەوتووە ‹بە جێی هێشتبووم گرتمەوە› ١١. پێست لێ‌داڕنین؛ کەوڵ کردنی حەیوان ‹پێستەکەی بگرەوە!› ١٢. تێکوڵ لێ‌کردنەوەی میوە ‹پۆستی دوو خەیارم گرتەوە!› ١٣. خەرجی کەم کردنەوە ‹لە منداڵی خۆم گرتەوە دام بە ئەو!› ١٤. ڕاگرتن و بەند کردنی ئاوی خوڕی جۆگە و چەم و ڕووبار ‹گۆلەکەم گرتەوە› ١٥. قەدەغە کردن ‹لەو کارانەم گرتۆتەوە› ١٦. لە خۆ گرتن ‹ئەم بابەتانەش دەگرێتەوە› ١٧. ئازاد کردن؛ لە دەستی دژمن دەرهێنان ‹گرتنەوەی مووسڵ› ١٨. دەست بە سەردا گرتن؛ کردنە هی خۆ 🕮 ١. برآورد کردن سنگ ترازو ٢. قاپیدن در هوا ٣. تهیه و ترکیب کردن رنگ یا دارو ۴. جا انداختن دررفتگی یا شکستگی استخوان ۵. سر کتاب باز کردن ۶. فال گرفتن ۷. بازگرفتن آنچه دررفته است ۸. سرایت کردن بیماری ۹. قضا کردن روزه ۱۰. رسیدن به پیشتاز ۱۱. پوست کندن جانور ۱۲. پوست گرفتن میوه ۱۳. صرفه‌جویی کردن ۱۴. بند آوردن آب جاری ۱۵. بازداشتن ۱۶. در برداشتن ۱۷. بازپس گرفتن ۱۸. اشغال کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەگرتنەوە

**گرتۆلە** / girtole/: ئاوەڵناو. ١. سەیر و سەمەرە ٢. جێ‌ترس؛ بەسام 🕮 ١. عجیب و غریب ٢. ترسناک

**گرتو**[1] / girtû/: ناو. گرتی: ١. دیل؛ ئێسیر ٢. بەندی؛ زیندانی 🕮 ١. اسیر ٢. زندانی

**ـ گرتو**[2]: پاشوشە. ـ گرتە؛ ـگرتگ؛ ـ گرتی ‹پێ‌گرتوو؛ خۆگرتوو؛ بۆن‌گرتوو› 🕮 ـگرفته

**گرتوخانە** / girtûxane/: ناو. گرتیخانە؛ بەندیخانە؛ زیندان؛ زینان ‹دەمگرێ، ئەمما لە گرتووخانە ڕۆئەستوورترم/ لێم دەدا، ئەمما لە سەر داوا ڕەواکەم سوورترم «هێمن»› 🕮 زندان

**گرتون** / girtûn/: ☜ **گرواندن**

**گرتە**[1] / girte/: ناو. ١. فایلی دەنگ، ڕەنگ و ... کە لە دیاردەیەک گیرابێ ‹گرتەی ڤیدیوئی؛

گرتـەی دەنـگ› ٢. *[ریازی]* بابـەتێکی گرینگـی بیرکارییە ☲ ١. فایل ٢. مُشتق

**گرتـە**[٢]: ئاوەڵـناو. خـەمبار؛ دڵـتەنگ ☲ انـدوهگین؛ گرفته

**. گرتە**[٣]: ☜ **ـ گرتوو**[٢]

**گرتـــەرەی / girterey**: چـــاوگ. داگـــــرتن ☲ دربرگرفتن

**گرتەک / girtek**: ناو. بەڵگەی وام؛ قەبزی قەرز ☲ سند وام

**گرتەکان / girtekan**: ☜ **گوێز**[١]**ـ١**

**گرتەی / girtey**: چاوگ. گرتن ☲ گرفتن

**گرتی / girtî**: ☜ **گرتوو**

**گرتیخانە / girtîxane**: ☜ **گرتووخانە**

**گرچک / girçik**: نـاو. ١. ☜ **گورچیلـە** ٢. *[کینایە]* خالیگە؛ برک؛ کەلەکە ٣. گرێ دار کـە زەق بـێ ٤. تیخی کەڵوکەت ☲ ١. ☜ **گورچیلە** ٢. گُـردە؛ تُهیگاە ٣. گره برجستەی تنەی درخت ۴. تیـغ کُنـد و لب‌پر

**گـــرچن / girçin**: ئاوەڵـــناو. ١. بـــەگرێ (دار) ٢. کەڵوکەتبوو (تیخ) ☲ ١. گرەدار ٢. کُند و لب‌پر

**گرچوبر / girç û biř**: ☜ **گورچوبڕ**

**گرچوو / girçû**: ☜ **گورچیلە**

**گرخ / girx**: نـاو. ١. کپایی دەنگی گەروو ٢. بێـز؛ قێز ☲ ١. گرفتگی صدا ٢. بیز؛ حالت دل بەهم آمدن از چیزی

▣ **گرخ بـوون**: کپ بوونی دەنگ؛ دەنگ کەوتن ☲ صدا گرفتن

**گرخم / girxim**: ناو. قرخم؛ کـوریژ؛ وردە بڕشـتی بەنی تەون ☲ ریزەهای نخ در قالیبافی

**گرد**[١] **/ gird**: ناو. ١. گر؛ تەپە؛ تەپۆڵـکە ٢. ڕەوتی کۆ بوونەوە ٣. دەورە؛ پەڕانپـەڕ ٤. سـوور؛ ڕەوتی گێژ دان ☲ ١. تپّە ٢. همایش ٣. پیرامون ۴. چرخش؛ گردش

▣ **گردی گلان**: گردی وا کە سواری لێ دەگلـێ ☲ تپەای کە سوارکار را بە زمین می‌زند

**گـرد**[٢]: ئاوەڵـناو. ١. خـڕ وەک تـۆپ ٢. ئاڵـقەیی؛ جەغزی ٣. گرۆڤەر؛ گلیل؛ خڕ وەک داردۆژەنـگ ٤. گەوزە؛ درشت ٥. هەموو؛ تێکڕا ٦. کورتـەباڵا؛ بـاڵاپچووک ☲ ١. گِـرد؛ کُـروی ٢. دایـرەای ٣. استوانەای ۴. درشت ۵. همە؛ کل ۶. کوتاەقد

▣ **گرد بوون**: ☜ **گرد بوونەوە**

**گرد بوونەوە**: گرد بـوون؛ کـۆم بوونـەوە ☲ جمـع شدن

**گرد کردن**: ١. کۆم کردن ٢. خڕ هەڵـدان ☲ ١. جمع کردن ٢. مُدوَّر کردن

**گرد کردنەوە**: گردۆ کردن؛ کۆ کردنەوە ☲ جمـع کردن

**گردۆ کردن**: ☜ **گرد کردنەوە**

**گردمو کردن**: کۆ کردنەوە ☲ جمع کردن

**گردەوە بوون**: کۆ بوونەوە ☲ جمع شدن

**گرد**[٣]: ئاوەڵکار. هەموو؛ تێکڕا ☲ همە؛ کل

**گرداڤ / girdav**: ناو. ١. ئاوی زۆر و خوڕ کە خول ئەدا ٢. *[کینایە]* کارەسات و بەڵا ☲ ١. گرداب ٢. بلا و مُصیبت

**گرداق / girdaq**: ☜ **گێژاو**

**گرداو / girdaw**: ☜ **گێژاو**

**گردایگرد / girdaygird**: ناو. دۆراندۆر؛ دەوروبـەر؛ دەور ☲ پیرامون

**گردش / girdiş**: چـاوگ. ترووکـان؛ شـکاندن (بـە ددان) ☲ شکستن (با دندان)

**گردشـاندن / girdişandin**: چـاوگ. تـرووکانـــدن؛ تووکانن ☲ شکستن (با دندان)

**گردک / girdik**: ناو. ماسوولکە؛ مایچە ☲ ماهیچـە؛ عضُله

**گردن / girdin**: ☜ **گرتن**

**گردنەوە / gird(i)newe**: ☜ **گرتنەوە**

**گردوپەڕ / gird û peř/**: ناو. دۆراندۆر؛ دەورانـدەور؛ کشت‌وکنار ☰ پیرامون

**گردوکۆ / gird û ko/**: ناو. گردەوەکۆیی: ١. کـار و ڕەوتی کۆ کردنەوەی بـارەی زەمـین ‹گردوکـۆی خەرمان› ٢. پاشەناز؛ پاشەکەوت ٣. *[مەجاز]* کار و ڕەوتی کۆ کردنەوەی بەرهەمی ئەدەبی، هونەری یان زانستی ☰ ١. جمع‌آوری محصولات ٢. پس‌انداز ٣. تدوین

**گردوکۆش / gird û koş/**: ناو. کردوکۆش ☰ تلاش

**گردولکـە / girdulke/**: نـاو. گـرد؛ گردوولکـە؛ حەدەف؛ تەپۆلکە ☰ تپّه

**گردۆلـک / girdolik/**: نـاو. ١. گردۆڵـک؛ کۆمـا؛ ئەوەی بە سەر یەکـدا هەڵـدرابێتەوە ٢. تەپـەی چکۆلە؛ گردی پچووک ☰ ١. کپه؛ تـوده ٢. تپـەی کوچک

**گردۆڵک / girdołik/**: ☜ **گردۆڵکە**

**گردۆڵکە / girdołke/**: ناو. گردۆلک؛ گردەلـە: ١. گردۆلـک؛ هـەر شـتی بـە سـەر یەکـدا کـراوی بەرزەوەبوو ٢. خۆیانی بە سـەر یەکـداکراو ☰ ١. کُپه ٢. تودەی خرمن باد نداده

**گردۆڵـە / girdoła/**: نـاو. ١. تـەپکی پچـووک ٢. نێفـەکی دەرپـێ ☰ ١. تپـەی کوچـک ٢. خشـتک تُنبان

**گردوولکە / girdûlke/**: ☜ **گردولکە**

**گردە**[١] **/ girde/**: ناو. ١. جۆرێ برنج ٢. درشتەی ناو شتی ورد ٣. سـەلکی گیـای سـارمە ٤. خـول و سوور ٥. کۆلکەی ئەسـتوور ٦. قـوژبنی مـاڵ ٧. ئەستوورایی سەرووی ئێسـکی ڕان ‹گـردەی ڕانی شکاوە› ٨. تەڕاد؛ خالیگە؛ بـرک ٩. دورگـە؛ ئـاد؛ جزیرە ☰ ١. نوعی برنج ٢. درشتەی میـان چیزهـای ریز ٣. پیازەی گیـاه سـلمک ۴. چـرخش ۵. کُنـدەی ستبر ۶. گوشەی خانه ۷. سر استخوان ران ۸. تُهیگـاه ۹. جزیره

**گردە**[٢]: ناوەڵناو. ١. تۆپەڵ؛ خڕی تۆپی ٢. ئاڵـقەیی؛ جەغزی ٣. تێکڕا؛ هـەموو سـەرجەم ☰ ١. مُـدوّر؛ کروی ٢. دایره‌ای ٣. همگی

**گردەبا / girdeba/**: ☜ **گێژەڵوکە**

**گردەبڕ / girdebiř/**: ناو. ١. شەقەمشار ٢. کۆلکەی بە شەقەبڕاو ٣. چۆنیەتی لەت بوون (زیاتر ئێسک) بە شێوەی بازنەیی ☰ ١. ارّەی دونفره ٢. کُندەی بـا ارّه بریده ٣. قطع (استخوان)

**گردەبنە / girdeb(i)ne/**: ناوەڵناو. خڕپلانە؛ کورتەڵە ☰ کوتوله

**گردەپیاو / girdep(i)yaw/**: ناو. پیاوی کورتەباڵای خڕەکە ☰ مرد کوتاه‌قد

**گردەڕان / girdeřan/**: نـاو. سـەری خـڕی ئێسـکی ڕان ☰ سرِ استخوان ران

**گردەژن / girdejin/**: ناو. کورتـەژن؛ ژنی کورتـەباڵا ☰ زن کوتاه‌قد

**گردەشان / girdeşan/**: ناو. قەدی چیا ☰ سینه‌کش کوه

**گردەک / girdek/**: ناو. پیتی درشتی ئەلفوبـێ لـە نووسیندا ☰ حرف درشت الفبا در نوشتن

**گردەکان / girdekan/**: ناو. گوێز ☰ گردو

**گردەکلاش / girdek(i)łaş/**: ناو. *[پلار]* گوردە؛ زارۆی ژن لە شووی پێشوو ☰ فرزند زن از شوهر پیشین

**گردەکۆ / girdeko/**: ☜ **گوێز**[١]**ـ١**

**گردەڵ**[١] **/ girdeł/**: ناو. بان‌گوێر؛ بانگوش؛ بـاگردێن؛ بنگلان ☰ بام‌غلتان

**گردەڵ**[٢]: ناوەڵناو. ١. چکۆلە؛ بووچک ٢. خڕی وەک تۆپی چکۆلە ☰ ١. ریز ٢. کروی کوچک

**گردەڵـە**[١] **/ girdełe/**: نـاو. ١. نێفـەکی دەرپـێ ٢. نەرمـەزین ٣. ☜ **گردۆڵکـە** ٤. ئـامرازێ لـە ئاسیاودا ٥. دەپێ کـە جـۆلا بـووزووی لـە سـەر دەپێچـێ ٦. بەنـدی قامـک ٧. تۆپـە عەرابـەی یەکپارچـە لـە دار تاشـراو ٨. کۆلکـەداری خـڕ و

درشت ٩. ☜ گرۆڵ ☰ ١. خشتک تُنبان ٢. نمد زین ٣. ☜ گردۆڵك ۴. ابزاری در آسیاب ۵. تختەای در جولایی که شال را بر آن می‌پیچند ۶. بند انگشت ۷. چرخ گاری چوبین یکپارچە ۸. کُندەی گرد و بزرگ ٩. ☜ گرۆڵ

**گردەڵە**[٢]: ئاوەڵناو. خڕی چکۆلە ☰ کروی کوچک

**گردەنشین** / girden(i)şîn/: ناو. داکەوتوو لە سووچی ماڵ ‹هێز و سۆمای نییە باڵ و چاوم/ ملمەوە گردەنشین بێڕاوم! «هەژار، بۆ کوردستان»› ☰ ازکارافتاده

**گردەوەکۆیی** / girdewekoyî/: ☜ گردوکۆ

**گردی**[١] / girdî/: ناو. ١. درشتی ٢. وردی ٣. ڕەوتی کۆوە بوون ☰ ١. درشتی ٢. ریزی ٣. گردهمایی

▣ **گردی سەن**: کار و ڕەوتی دانە پەی؛ لە شوێن چوون ☰ جستجو

**گردی**[٢]: ئاوەڵکار. تێکڕا؛ هەموو ☰ همه

**گردیشک** / girdîşik/: ناو. ئاڵەکۆک ☰ گیاهی است

**گردیلکە** / girdîlke/: ناو. کووپەڵە ☰ کوزەی کوچک

**گردیلە**[١] / girdîle/: ناو. ١. تەپۆلکە؛ تەپەی چکۆلە ٢. گردیلکە؛ کووپەڵە ☰ ١. تپەی کوچک ٢. کوزەی کوچک

**گردیلە**[٢]: ئاوەڵناو. خڕی پچکۆلە ☰ مُدوَّر کوچک

**گردین**[١] / girdîn/: ئاوەڵناو. گەردین؛ هەموو ‹ئایر سەندە بێ جە گردین لاوە/ پووشکەی جەسەم وە ئەربەباوە «مەولەوی»› ☰ همه؛ کُل

**گردین**[٢]: ئاوەڵکار. هەموو؛ تێکڕا ‹یاران گردین شین وە توونای توونەدا/ هەر خەیاڵ مەندەن نە تۆی دەرووندا «مەولەوی»› ☰ همگی؛ همه؛ جمعاً

**گرژ**[١] / girj/: ناو. ↓

▣ **گرژ کردن**: گرژاندن؛ کەوڵ کردن؛ پێست لێ کردنەوە ☰ پوست کندن

**گرژ**[٢]: ئاوەڵناو. ١. درژ؛ ڕووترش؛ مرومۆچ؛ مۆن؛ مۆر؛ گەمۆر؛ ناوچاوترش؛ ناوچاوتاڵ؛ ناوچاوگرژ ٢. خەمۆک؛ دژ؛ دوژ؛ ژاکاو؛ دژداماو؛ کز؛ چرمسیو؛ دوش ‹لە تاوی ئێوەیە وا مات و گرژم/ لە سوێی ئێوە دەسووتێم و دەبرژم «هێمن»› ٣. بادراو؛ لوولدراو ‹گا گرژ و لوولەن چوون زولف نمناک/ گا باد مەکەرۆش تاتا جە هەم تاک «بێسارانی»› ☰ ١. اخمو ٢. افسُردە ٣. تاب‌خوردە

▣ **گرژ بوون**: ١. ڕوو ترش کردن ‹هەواڵ خالید گرژ بوو، ئیتر نقەی لێ نەهات «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. تووڕە بوون ٣. خەمۆک بوون؛ ناڕەحەت و کز دیار بوون ٤. توندەوە بوونی بەن بە بادان ٥. گرژ بوون؛ ڕاست بوونەوە ‹دەستم بۆ کلاوەکەم برد، مووی سەرم وا گرژ بووە، وەک دەرزی لە کلاوەکەمەوە دەرچووبوون «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ ١. اخم کردن ٢. خشمگین شدن ٣. افسردە گشتن ۴. تاب داشتن نخ ۵. سیخ شدن

**گرژ هەڵاتن**: سیس و چرچ بوون ☰ پژولیدن؛ چروک شدن

**گرژاڵ**[١] / girjał/: ناو. سووری ئاماڵڕەش؛ ڕەنگێکە بۆ مەرەز، کە نێوانی ڕەش و سوورە ☰ قرمز سیەفام

**گرژاڵ**[٢]: ئاوەڵناو. لێک‌پێچراو؛ ئاڵۆزاو ☰ درهم پیچیدە

**گرژاندن** / girjandin/: چاوگ. ١. کەوڵ کردن ٢. شڵەقاندن؛ تێک‌وەردان ☰ ١. پوست کندن ٢. بە هم زدن

**گرژانە** / girjane/: ئاوەڵناو. توندوتیژ بە دۆخێکی نادۆستانە، هاوڕێ لەگەڵ تووڕەیی ‹هەڵس‌وکەوتی گرژانە› ☰ خشونت‌آمیز

**گرژی** / girjî/: ناو. ١. خەمۆکی؛ کزی و خەمباری ٢. تووڕەیی ٣. توند و تیژی؛ بارودۆخی

هەڵچوون ‹ڕێگە مەدەن گرژی و ئاڵۆزی پەرە بستێنێ› ٤. بادراوی ☰ ١. افسردگی ٢. خشم ٣. خشونت ۴. تاب‌خوردگی

**گرژیخواز** / girjîx(i)waz/: ئاوەڵناو. لایەنگری توند و تیژی؛ بە خدە و وازی گرژانەوە. هەروەها: **گرژیخوازی** ☰ خشونت‌طلب

**گرژین** / girjîn/: چاوگ. ١. گرژینەوە؛ گرنژین؛ بزە کردن ٢. شڵەقان؛ شڵەقیان ☰ ١. لبخند زدن ٢. به هم زده شدن

**گرژینەوە** / girjînewe/: ☜ **گرژین ـ١**

**گرس**[١] / girs/: ناو. کاریتە؛ حەماڵ؛ شاتیر ☰ بالار

**گرس**[٢]: ئاوەڵناو. ١. مەزن؛ پایەبەرز ٢. توند و لێک‌چەسپاو ٣. خولقاو؛ ڕسکاو ٤. گرسک؛ ڕەق؛ سفت (بۆ کێلان) ٥. بە قەوار؛ ئەستوور ٦. زبر؛ زرو ٧. درشت؛ گەورە ☰ ١. بزرگوار ٢. مُحکم و به هم چسبیده ٣. رسته؛ تکوین یافته ۴. سخت و سفت (در شخم) ۵. هیکلی ۶ زبر ٧. درشت

⊡ **گرس بون**: خولقیان؛ ڕسکان ‹تۆمەکە گرس بووە؛ پیزە لە ناو سکیا گرس بووە› ☰ تکوین یافتن

**گرسان** / girsan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //گرسای؛ دەگرسی؛ بگرسێ// گرسیان؛ گیرسان: ١. مەیین؛ بەسیان ‹ماستەکە گرسا› ٢. پێ‌بوون؛ هەڵبوون ‹ئاگرەکە گرسا› ٣. لەش گەرم داهاتنی نیشانەی تا ٤. ڕسکان؛ خولقان ٥. گرتن؛ سەوز بونی پێوەندی دار ☰ ١. مُنعقد شدن ٢. افروختن ٣. گرم شدن تن به نشانەی تب ۴. تکوین یافتن ۵. گرفتن پیوند درخت

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: گرساو/ چاوگی نەرێنی: نەگرسان

**گرساندن** / girsandin/: چاوگ. تێپەڕ. //گرساندت؛ دەگرسێنی؛ بگرسێنە// ١. بە گەورە زانین ٢. توند و لێک چەسپاو کردنی تراو ☰ ١. محترم دانستن ٢. مُنعقد کردن مایع

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەگرساندن

**گرسانەوە** / girsanewe/: چاوگ. تێنەپەڕ. //گرسایەوە؛ دەگرسێیەوە؛ بگرسێوە//گرسیانەوە: ١. گیرسانەوە؛ خۆ گرتنەوە ‹پەلم هاویشتە لقەداری لە سەری گرسامەوە› ٢. مانەوە لە شوێنێک ‹لەو دێیە گرسامەوە› ٣. جۆش خواردن؛ لکانەوەی دوو پارچە ئێسکی شکاو ‹بزانە باڵی شکابوو، گرساوەتەوە؟› ☰ ١. واچسبیدن؛ گیر کردن ٢. ماندگار شدن ٣. جوش خوردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: گرساوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەگرسانەوە

**گرساو** / girsaw/: ئاوەڵناو. گرسیاگ: ١. ڕسکاو؛ خولقاو ٢. داگرسیاگ؛ هەڵکراو ٣. مەییو؛ بەسراو؛ ئەماس؛ گرسی ‹خوێنی گرساو› ☰ ١. تکوین یافته ٢. افروخته ٣. مُنعقد

**گرسای** / girsay/: چاوگ. مەیین؛ توند بوونی تراو ☰ مُنعقد شدن

**گرسڤا** / girs(i)va/: ئاوەڵناو. گەردن‌زەرد؛ خاوەن گەردنی جوان و سپی و ناسک ☰ دارای گردن سفید و زیبا

**گرسک**[١] / girsik/: ☜ **کرۆسك ـ١**

**گرسک**[٢]: ئاوەڵناو. گرس؛ ڕەق هەڵاتوو (کێڵگە) ☰ سخت در شخم (کشتزار)

**گرسنای** / girsnay/: چاوگ. مەیاندن ☰ مُنعقد کردن

**گرسە** / girse/: ناو. تۆڵا؛ قورسە ☰ چگال

**گرسەژۆ** / girsejo/: ناو. دۆخی بلێسە کێشان و کڵپە کردن ‹لە بەر گرسەژۆی ئاورەکە سەر و چاومان داپۆشیبوو› ☰ حالت زبانه کشیدن

**گرسی** / girsî/: ☜ **گرساو ـ٢**

**گرسیاگ** / girs(i)yag/: ☜ **گرساو**

**گرسیان** / girs(i)yan/: ☜ **گرسان**

**گرسیانەوە** / girs(i)yanewe/: ☜ **گرسانەوە**

**گرش** / girş/: ناو. داری دارەڕا 🇮🇷 دیرک؛ چوب سقف

**گرشمه** / g(i)rişme/: ناو. گریشمه؛ کز و نیز؛ کەشم و نەشم؛ ناز و نیمناز 🇮🇷 کرشمه

**گرشه** / girşe/: ناو. ١. کلۆش؛ قرشه ٢. تایه؛ کۆمایەک لە باقەی لە سەر یەک دانراو ٣. درەوشە؛ بریقه 🇮🇷 ١. سپاری؛ ساقەی غله ٢. تودەای از بستەهای سپاری و گیاه ٣. درخشش

**گرشەدار** / girşedar/: ئاوەڵناو. ورشەدار؛ وریشن؛ بریقەدار 🇮🇷 درخشنده

**گرشەگرش** / girşegirş/: ناو. بریقه و گرشه؛ ترووسکه 🇮🇷 درخشش

**گرفت** / g(i)rift/: ناو. ١. ئینتەلا؛ نەخۆشی لە هەزم نەکردنی خۆراکەوە ٢. بەرگر لە کار ٣. گرفتاری کۆسپ؛ گیر و گرفت؛ بارودۆخی دژوار و گێچەڵ ‹هیچ گرفتێک بە گرژی و توند و تیژی چارەسەر ناکرێت› 🇮🇷 ١. بیماری امتلا ٢. مانع کار ٣. مُشکل

**گرفتار** / g(i)riftar/: ئاوەڵناو. ١. تووشهاتوو؛ دوچار ‹کاری کوردەکان، گوزگە بە پارە/ هەر کەس بە دەردێک چوو، گرفتارە «سەیفولقوزات»› ٢. *[کینایه]* ئەویندار ‹بریندارم بە پەیکانی دوو چاوی/ گرفتارم بە داوی زولفی خاوی «مینەجاف»›.

هەروەها: **گرفتاری** 🇮🇷 ١. گرفتار ٢. عاشق

**گرفنج** / girfinc/: ناو. گرفنچ: ١. ڕەوتی تێکئالۆزانی بەن و دەزوو ٢. گرێیەکوێرە؛ گرێپووچکە؛ گرێی پچووکی دژوار لە کردنەوە ٣. ☜ **گرفنچك** 🇮🇷 ١. سردرگمی نخ ٢. گره کور ٣. ☜ **گرفنچك**

**گرفنچ** / girfinç/: ☜ **گرفنچك**

**گرفنچك** / girfinçik/: ناو. گرفنج؛ گرفنچ؛ دلۆ لە ڕیسدا کە لە کاتی تەشی ڕستندا بە ددان دەیقرتێنن 🇮🇷 غُدەی ریس

**گرفه** / girfe/: دەنگەناو. کلپه؛ دەنگی گڕی ئاگر 🇮🇷 صدای شعلەی آتش

**گرفەگرف** / girfegirf/: دەنگەناو. کلپەکلپ؛ گرفەی لە دوای یەک 🇮🇷 صدای پیاپی شعله

**گرك** / girk/: ناو. ١. تاقەت؛ تابشت؛ قەوەت ٢. دەستار؛ هارە؛ هارەکر ٣. دووگی وشتر ٤. کولێره ٥. تۆلا؛ دۆخی پێکەوە نووسان و ڕەق بوونی شتی ورد ٦. تەپۆلکه؛ گرتک؛ گردی پچووک 🇮🇷 ١. تاب؛ توان ٢. دستاس ٣. پیه شتر ۴. گرده نان ۵. توده ۶. تپەی کوچک

**گرکاندن** / girkandin/: چاوگ. گرگاندن؛ پاک کردنەوەی دەغڵ و برنج لە تێکوڵەکەی 🇮🇷 پوست کندن برنج و غلات

**گرکچك** / girkiçik/: ناو. مرۆر؛ دەنکێکی تاڵە لە ناو گەنمدا 🇮🇷 تلخک گندم

**گرکەش** / girkeş/: ناو. باوشک؛ باوێشک 🇮🇷 خمیازه

**گرکی** / girkî/: ناو. قسەیەک کە نازانرێ مەبەست چییه 🇮🇷 سخن مُبهم

**گرکین** / girkîn/: چاوگ. پاک کردنەوەی دەغڵ 🇮🇷 بوجاری کردن

**گرگ** / girg/: ناو. گەدگ؛ کرش؛ عوور 🇮🇷 شکمبه؛ معده

**گرگاز** / girgaz/: ناو. گرگازۆڵه؛ گرگازه؛ گیایەکه 🇮🇷 گیاهی است

**گرگازۆڵه** / girgazołe/: ☜ **گرگاز**

**گرگازه** / girgaze/: ☜ **گرگاز**

**گرگاشه** / girgaşe/: ناو. بەڵا و نەهامەت 🇮🇷 بلا؛ مُصیبت

**گرگاندن** / girgandin/: ☜ **گرکاندن**

**گرگرۆك** / girg(i)rok/: ناو. عەرەبانەی زارۆکان 🇮🇷 ارادەی اسباببازی

**گرگره** / girg(i)re/: ئاوەڵناو. پایەبەرز و گەوره 🇮🇷 بلندپایه

**گرگن** / girgin/: ئاوەڵناو. زگ‌زل ☰ شکم‌گُنده

**گرگنە** / girg(i)ne/: ئاوەڵناو. کورتەباڵای زگ‌زل ☰ کوتاه‌قد شکم‌گُنده

**گرگین** / girgîn/: ئاوەڵناو. تووڕەی ڕک‌هەستاو ☰ خشمگین

**گرم** / gir(i)m/: دەنگ. ١. دەنگی زل وەک دەنگی تۆپ و هەور ٢. دەنگی کەوتنی شتی قورس ‹گرم بە عەرزدا کەوت› ☰ ١. صدای غُرنب ٢. صدای افتادن جسم سنگین

**گرماندن** / girmandin/: چاوگ. تێپەڕ. //گرماندت؛ دەگرمێنی؛ بگرمێنە// گرمان؛ گرمین؛ گورماندن؛ گورمین؛ گومین؛ دەنگی زل لێ‌هاتن ‹هەور گرماندی› ☰ غُرنبیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەگرماندن

**گرمانن** / girmanin/: ☜ **گرماندن**

**گرمخین** / girm(i)xîn/: چاوگ. ١. ڕزین؛ هەڵا بوون ٢. گەنین؛ گەنخین ٣. شوتنەوە و کوژاندنەوەی خەتی نووسراو ☰ ١. پوسیدن ٢. گندیدن ٣. پاک کردن نوشته

**گرمخیو** / girm(i)xîw/: ئاوەڵناو. ١. پواو؛ ڕزیو ٢. گەنیو؛ گنخاو ☰ ١. پوسیده ٢. گندیده

**گرمژن** / g(i)rmijn/: دەنگەناو. دەنگی ڕووخان و بەر بوونەوەی زۆر شتی گەورە ‹گرمژن و خرمژنی بەردی بەردەستی فەرهادی مەرد ڕاپەڕاندم و تێیگەیاندم کە: خەیاڵ پڵاو دادێک نادا! «هەژار، *شەرەفنامە*»› ☰ غُرنبیدن

**گرمژنە** / girmijne/: ☜ **گرمەژنە**

**گرمژە** / girm(i)je/: ☜ **گرمەژنە**

**گرمست** / girmist/: ☜ **گوڕمچە**

**گرمش** / girmiş/: چاوگ. لەپڕ خۆ پێدادان ☰ ناگهان به چیزی کوبیدن

**گرمک** / girmik/: ناو. تولە؛ گرکە؛ گندۆڕە ☰ گرمک

**گرمنای** / girmnay/: چاوگ. گرماندن ☰ غُرنبیدن

**گرمنەی** / g(i)rimney/: چاوگ. گرماندن ☰ غُرنبیدن

**گرموهۆڕ** / girm û hoř/: دەنگەناو. دەنگی بە قەوی زۆر ‹هەوران گرموهۆڕیانە/ دنیا مژ و بارانە «شیعری منداڵان»› ☰ غُرنبەی زیاد

**گرمۆتکە** / girmotke/: ☜ **گرمۆڵە**

**گرمۆتە** / girmote/: ☜ **گرمۆڵە**

**گرمۆڵە** / girmołe/: ئاوەڵناو. گرمۆتکە؛ گرمۆتە؛ گرمووله؛ گمۆڵە؛ چکۆڵەی خڕکەڵە ☰ گِرد و ریز

⊡ **گرمۆڵە کردن**: گرمووله کردن؛ تێک‌ئاڵاندن و خڕ کردنەوە ‹لە سەرمادا خۆی گرمۆڵە کردبوو› ☰ گلوله کردن

**گرموله** / girmûle/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **گرمۆڵە** ٢. لە دەوری یەک ئاڵاوی خڕەوبوو ☰ ١. ☜ **گرمۆڵە** ٢. در هم تنیده

⊡ **گرموله کردن**: ☜ **گرمۆڵە کردن**

**گرمە** / girme/: دەنگەناو. گورم؛ گورمە؛ دەنگی گرموهۆڕ ☰ غُرنُبە

**گرمەژنە** / girmej(i)ne/: ناو. گرمژنە؛ گرمژە؛ زیپکەی چکۆڵە لە تاوبردنەوە ☰ جوش ریز پوست از آفتابزدگی

**گرمەگرم** / girmegirm/: دەنگەناو. گرمەی بە دووی یەکدا ‹گرمەگرمی هەورانە؛ گرمەگرمی تۆپان دێ› ☰ غُرُنبەی متوالی

**گرمین** / girmîn/: ☜ **گرماندن**

**گرناز** / girnaz/: ☜ **گرناڵ**

**گرناس** / girnas/: ☜ **گەڕناس**

**گرناڵ** / girnał/: ئاوەڵناو. گرووز؛ گرناز؛ گرنۆز؛ زبر و قورنجقورنج (وەک تێکولە بادام) ☰ زبر و ناهموار

**گرناڵ ـ گرناڵ** / girnał girnał/: ئاوەڵناو. گرناڵ؛ زرو ☰ زبر و ناهموار

**گرنای** / girnay/: چاوگ. گارەگار کردن ☰

کراخیدن

**گرنج**[١] / g(i)rinc/: ناو. گرینج؛ برنج 🇮🇷 برنج

**گرنج**[٢]: ناوەڵناو. گرینج؛ قورنج؛ زۆر زبر 🇮🇷 بسیار زبر

**گرنجاڕ** / g(i)rincař/: ناو. چەڵتووک‌جاڕ 🇮🇷 شالیزار

**گرنجبەشیر** / g(i)rincbeşîr/: ناو. برنجبەشیر؛ شیروبرنج 🇮🇷 شیربرنج

**گرنج ـ گرنج** / g(i)rinc g(i)rinc/: ناوەڵناو. قورنج ـ قورنج ‹بنی کەوشەکەم گرنج ـ گرنجە› 🇮🇷 آجیده؛ زبر

**گرنچک** / g(i)rinçik/: ناو. بەندی قامیش؛ گرێ‌قامیش 🇮🇷 بند نی

**گرنژ** / g(i)rinj/: ناو. بزە؛ زەردە 🇮🇷 لبخند

**گرنژاندن** / g(i)rinjandin/: چاوگ. ١. چرچ و لۆچ کردن ٢. هەڵقرچاندن ٣. *[کینایە]* هێنانە پێکەنین 🇮🇷 ١. چروکاندن ٢. در اثر حرارت جمع کردن ٣. خنداندن

**گرنژۆک** / g(i)rinjok/: ناوەڵناو. دەم بە بزە؛ دەڤکەنی 🇮🇷 خنده‌رو

**گرنژین** / g(i)rinjîn/: چاوگ. ١. لۆچ بوون ٢. *[کینایە]* بزە هاتنە سەر لێوان 🇮🇷 ١. چروک شدن ٢. لبخند زدن

**گرنگ** / g(i)ring/: ناو. گرینگ؛ پڕبایەخ ‹گرنگ، کورسییەکی ساردوسڕی وەک تابووتی بن مردووە/ گرنگتریش ئەو دۆلارە چاوسەوزانەن/ کە بۆ غوربەت/ سەری خۆیان هەڵگرتووە! «پەشێو»›. هەروەها: **گرنگ بوون** 🇮🇷 مُهم؛ بااهمیت

**گرنگنای** / g(i)ringnay/: چاوگ. ١. لۆراندن ٢. گێزە کردن 🇮🇷 ١. زوزه کشیدن ٢. وز ـ وز کردن

**گرنگی** / g(i)ringî/: ناو. گرینگی؛ بایەخداری 🇮🇷 اهمیت

**گرنۆر** / girnor/: ناو. گڕناڵ؛ زرو 🇮🇷 زبر

**گرنۆز** / girnoz/: ☜ **گرناڵ**

**گرنووز** / girnûz/: ناو. شتی جوان و بەرچاو 🇮🇷 چیز زیبا و چشمگیر

**گرنووگ** / girnûg/: ناو. تۆقتۆقیلە؛ گیایەکە 🇮🇷 گیاهی است

**گروان** / g(i)rwan/: چاوگ. گووروان؛ گورووتن؛ لاشی ئاژەڵی سەربڕاو لە ئەستۆوە دەرهاتن 🇮🇷 گوشت و استخوان حیوان ذبح شده از گردن درآمدن

**گرواندن** / girwandin/: چاوگ. گروون؛ گورروون؛ گووروون؛ گرووتن؛ گرتوون؛ گووروواندن؛ لاشی ئاژەڵی سەربڕاو لە ئەستۆوە دەرهێنان، بێ ئەوەی کەوڵەکەی بدڕێ، کە بۆ هەنبانە و مەشکە کەڵکی لێ وەردەگرن 🇮🇷 گوشت و استخوان حیوان ذبح شده را از گردن درآوردن

**گروانکە** / girwanke/: ناو. گەروانکە؛ کێشانەیەکە بۆ چایی بەرانبەر بە چوارسەتودە گرەم 🇮🇷 وزنی است معادل چهارصدوده گرم

**گروف** / g(i)ruf/: ☜ **گروڤ**

**گروڤ** / g(i)ruv/: ناو. گروف؛ قانگل؛ قانگڵە؛ قانگڵەبەن 🇮🇷 کلاف نخ میان دو انگشت باز

**گروک** / g(i)ruk/: ناو. ١. ئاوریشمی خاو ٢. کورک؛ کولک؛ کووروو 🇮🇷 ١. ابریشم خام ٢. کُرک

**گروێس** / girwês/: ☜ **گوریس**

**گرۆ**[١] / g(i)ro/: ناو. گرەو: ١. کۆمەڵ؛ دەستە ‹سێ گرۆ هاتن› ٢. شەرت؛ مەرج ‹گرۆم لێت بردەوە!› ٣. بارمتە ‹ماڵەکەم ناوەتە گرۆ› ٤. چۆنیەتی دانار بوونی ڕۆن و سەمەنی و ... ٥. چۆنیەتی خاوەخاو کردن 🇮🇷 ١. گروه ٢. شرطبندی ٣. گروگان ۴. چگونگی دان ـ دان شدن روغن و ... ۵. سُستی و اهمال

⊡ **گرۆ بردنەوە** گرۆ برن؛ گرەو بردنەوە: ١. لە شەرت بەستندا سەرکەوتن ٢. پێش کەوتن لە باقی 🇮🇷 ١. برنده شدن در شرطبندی ٢. پیش افتادن

**گرۆ برن**: ☜ **گرۆ بردنەوە**

**گرۆ بوون:** وه درەنگ کەوتن ◘ دیر کردن

**گرۆ کردن:** گرەو کردن؛ شەرت بەستن ◘ شرط بستن

**بە گرۆ گرتن:** بارمتە گرتن: ١. کەسێک وەک بارمتە یەخسیر کردن ٢. شتێک بە بارمتە گرتن ◘ ١. گروگان گرفتن ٢. گرو گرفتن

**لە گرۆدا بوون:** لە بارمتەدا بوون: ١. بۆ دەستەبەری بەڵێنێک بە دەستی کەسێکەوە بوون ٢. پێوە بەسران؛ بەندیوار بە کار یان ڕووداوێکی تر بوون ‹کۆتایی شەڕ لە گرۆی سەرکەوتندایە› ◘ ١. در گرو بودن ٢. در گرو کار یا شرایطی بودن

**نانە گرۆ:** لە بارمتە نان ◘ گرو گذاشتن

**گرۆ**[٢]: ئاوەڵناو. گرەو؛ ئۆگر؛ خۆگرتوو ◘ الیف؛ خوگرفته

◘ **گرۆ بوون:** دەستەمۆ بوون؛ خوو گرتن؛ ئۆگر بوون ◘ رام بودن

**گرۆ گرتن:** خوو گرتن ‹لەگەڵ یەک گیانە گرتمان گرۆ/ یەکترمان ئەدوان بە چاو و برۆ/ بەینمانیان تێک دا بێسووچ و بێهۆ «فولکلۆر»› ◘ خو کردن؛ عادت کردن

**گرۆبەر** / g(i)rober/: ئاوەڵناو. ١. بەرەندەی گرۆ ٢. *[کینایە]* پێشتر لە باقی ◘ ١. برندەی شرطبندی ٢. پیشرو

**گرۆبەندە** / g(i)robende/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* شەڕواز؛ زۆر ئازا لە شەڕ و جەنگدا ◘ شجاع و جنگاور

**گرۆر** / g(i)ror/: ناو. گلۆر؛ گلۆل؛ دەنکێ تاڵە لە ناو گەنمدا ◘ دانەای تلخ در گندم

**گرۆز** / g(i)roz/: ☜ **گرۆز**

**گرۆژی** / g(i)rojî/: ئاوەڵناو. کۆمەڵژی ◘ گروەزی

**گرۆس** / g(i)ros/: ناو. کاکیلە؛ خلێنە ◘ دندان آسیا

**گرۆسک** / g(i)rosk/: ☜ **کرۆسک-١**

**گرۆشک** / g(i)roşk/: ناو. ئامرازی بەردانی لوولە و گونجەی گیراو ◘ لولەبازکن

**گرۆفیک** / g(i)rofîk/: ناو. چەرخ و گاری پچووک ◘ گاری کوچک

**گرۆڤەر**[١] / g(i)rover/: ناو. گلۆڤەر؛ گولۆڤەر: ١. خڕ (وەک: تۆپ) ٢. جەغز (وەک: ئاڵقە) ٣. گلیل (وەک: لوولە) ◘ ١. کُره ٢. دایره ٣. استوانه

**گرۆڤەر**[٢]: ئاوەڵناو. گلۆڤەر؛ گولۆڤەر: ١. خڕ ٢. جەغز ٣. گلیل ◘ ١. کُرویە ٢. مُدوّر ٣. استوانەای

**گرۆک**[١] / g(i)rok/: ناو. تەپۆلکە؛ تەپەی چکۆلە ◘ تپەی کوچک

**گرۆک**[٢]: ☜ **گرینۆك**

**گرۆلە** / g(i)role/: ناو. گاری و عەرەبانەی بار کێشان ◘ گاری و ارادەی باربری

**گرۆڵ** / g(i)roł/: ناو. گردەڵە؛ گرۆلە؛ گلفەرک؛ گلوەڕ؛ گورۆڵ؛ گورۆڵە؛ پارچەیەکی سێسووچ بۆ بن باغەڵ لە کراس و چۆغە ◘ خشتک زیر بغل پیراهن

**گروو** / g(i)rû/: ناو. کاری لە لای ئەستۆوە لاشە لە پێست دەرهاوردن ◘ عمل لاشەی حیوان را از راه گردن از پوست در آوردن

**گرووتن** / g(i)rûtin/: ☜ **گرواندن**

**گرووز**[١] / g(i)rûz/: ناو. ١. هەڵتۆقاوی؛ پەنەماوی ٢. لوو؛ لک ◘ ١. ورم یا برآمدگی ٢. غُدّەی بارز

**گرووز**[٢]: ☜ **گرناڵ**

**گرووزین** / g(i)rûzîn/: چاوگ. هەڵتۆقین لە لەش یا زەمیندا ◘ برآمدن در بدن یا زمین

**گروون** / g(i)rûn/: چاوگ. گرواندن؛ لە لای ئەستۆوە لاشە لە پێست دەرهاوردن ‹گامان گرووە کلکی ماوە «مەسەل»› ◘ لاشەی حیوان را از راه گردن از پوست در آوردن

**گروونی** / g(i)rûnî/: ناو. گوروونی؛ جۆرێ قوماشی گوڵ گەورە ‹کەوای گروونی، سەڵتەی تاقمدار/ چەتفەی مەلیکی کێش و کلاولار «قانع»› ◘ نوعی

پارچە

**گرە**[1] / g(i)re/: ناو. ١. ☜ **گری-١** ٢. ☜ **گوێلە-١**

**گرە**[2]: ئاوەڵناو. گراگر؛ گرگرە؛ خاوەنپایە 🇮🇷 بلندپایە

**گرە-**[3]: پێشوشە. گەورە ‹گرەمێر› 🇮🇷 بزرگ

**گرەڤ** / g(i)rev/: ناو. باوەڕ؛ ئیمان ‹مرۆڤەکا خاوەن گرەڤە› 🇮🇷 ایمان

**گرەگر** / g(i)regir/: ناو. گرەگرە؛ پیاوماقوولان؛ پیاوانی پایەبەرز 🇮🇷 اشخاص سرشناس و بُلندپایە

**گرەگرە** / g(i)reg(i)re/: ☜ **گرەگر**

**گرەم** / g(i)rem/: ناو. گرام؛ گرام؛ یەکەی کێش بەرامبەر بە هەزار-یەک (٠,٠٠١)ی کیلۆگرەم 🇮🇷 گِرَم

**گرەمێر** / g(i)remêr/: ناو. پیاوی بە هەیکەل و درشت 🇮🇷 مرد قوی‌هیکل

**گرەو** / g(i)rew/: ☜ **گرۆ**

⊡ **گرەو بردنەوە**: ☜ **گرۆ بردنەوە**

**گرەو کردن**: ☜ **گرۆ کردن**

**گرەوای** / g(i)reway/: چاوگ. ١. جۆشین؛ کولین ٢. گریان ‹نالا و گرەوا و خولیاوە و خول وەرد/ جەو بووڵ دەردا وێش سامان‌سا کەرد «مەولەوی»› 🇮🇷 ١. جوشیدن ٢. گریستن

**گرەوتا** / g(i)rewta/: ئاوەڵناو. گرەوتە؛ گورۆتا؛ گورۆتە: ١. تێ‌تەپیو؛ بە زۆر تێئاخنراو ٢. گیراو؛ گراو؛ گیریاگ ٣. داپۆشراو؛ داپۆشیاگ 🇮🇷 ١. چپانده شده ٢. مسدود ٣. پوشیده

**گرەوتش** / g(i)rewtiş/: چاوگ. گورووتش؛ گیرەیش؛ گیریایش: ١. کڕین؛ سەنن؛ سەندن ٢. سەرپۆش لە سەر دەفر دانان ٣. تێئاخنین؛ تێ‌تەپاندن ٤. وەدەس هێنان ٥. توند بەستن (دەم) ٦. داپۆشین ٧. گەزین؛ پێوەدان 🇮🇷 ١. خریدن ٢. سرپوش گذاشتن (روی ظرف غذا) ٣. چپاندن ۴. به دست آوردن ۵. محکم بستن (دهان) ۶. پوشاندن ۷. نیش زدن

**گرەوتە** / g(i)rewte/: ☜ **گرەوتا**

**گرەونای** / g(i)rewnay/: چاوگ. گریاندن؛ هێنانە گریان 🇮🇷 گریاندن

**-گرەوە** / g(i)rewe-/: پاشەوشە. بە دوای ناوێکەوە دەلکێ و ناوی کارا ساز دەکا ‹باڵگرەوە؛ ماڵگرەوە› 🇮🇷 -کُن؛ -گیر

**گرەوەک** / g(i)rewek/: ☜ **گرەوی**

**گرەوەی** / g(i)rewey/: ☜ **گریان**[1]

**گرەوی** / g(i)rewî/: ئاوەڵناو. گرەوەک؛ لە بارمتە نراو 🇮🇷 گروی؛ در گرو

**گرەی** / g(i)rey/: ناو. گرێ؛ هەڵتۆقیوی لە لەشدا 🇮🇷 غدەی برجستە در بدن

**گرەیدر** / g(i)reydir/: ناو. ماشینی گەورەی ڕێوبان تەخت کردن، بە تێخەیەکی زەلام لە نێوان دوو تەگەرەی بەر و دواوە 🇮🇷 گریدر

**گرهان** / girhan/: چاوگ. گیران؛ گیریان؛ کپ بوون 🇮🇷 مسدود شدن

**گری**[1] / g(i)rî/: ناو. گریوە؛ گریە؛ گیریست 🇮🇷 گریە

**-گری**[2]: پاشەوشە. گریان ‹کەڵگری› 🇮🇷 گریە

**گریا** / girya/: ئاوەڵناو. کولیو؛ کولیاگ 🇮🇷 جوشیدە

**گریان**[1] / giryan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //گریای؛ دەگریێ؛ بگریێ// گرین؛ گیران؛ گیرستن؛ گیریان؛ گیرین؛ گرەوەی؛ گرەوای؛ فرمێسک/ئەسرین ڕژاندن ‹بە حاڵی خۆ گریان› 🇮🇷 گریستن؛ گریە کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: گریاو/ چاوگی نەرێنی: نەگریان

**گریان**[2]: ناو. گرین؛ گری 🇮🇷 گریە

⊡ **خستنە گریان**: ☜ **کردنە گریان(ـەوە)**

**دەس/ دەست کردنە گریان**: کەوتنە گریان 🇮🇷 بە گریە افتادن

**کردنە گریان(ـەوە)**: خستنە گریان؛ گریاندن؛ کردنە گرینەوە؛ بوونە هۆی گریانی کەسێ 🇮🇷

گریاندن؛ به گریه انداختن

**کەوتنە گریان** ☜ **دەس/ دەست کردنە گریان**

**گریان**[٢]: ئاوەڵناو. گریو؛ گریەکردوو یـا لـە حاڵـەتی گرین ‹جۆشش و تابە لە نێو دیـدەیی گریانـــمدا/ چ تەنوورێکە لە تەندوورەیی تۆفانمدا «نالی»› ⚑ گریان

**گریاندن** / /giryandin/: چـاوگ. تێـەپ. //گریانـدت؛ دەگریێنی؛ بگریێنـە// گریـانن؛ گیرانـدن؛ کەسـێ کردنە گریانەوە ‹ئەو منداڵە مەگریێنە› ⚑ گریاندن؛ به گریه انداختن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەگریاندن

**گریانن** / /giryanin/: ☜ **گریاندن**

**گریـای** / /giryay/: چـاوگ. کـوڵان؛ کوڵـــیان ⚑ جوشیدن

**گریپفرووت** / /g(i)rîpf(i)rût/: نـاو. ١. داری خـڕ و کورتەباڵای لە تیرەی مـزراتی ٢. مێـوەی مـزر و بۆنخۆشی ئەو دارە ⚑ ١و٢. گریپ‌فروت

**گریز** / /g(i)rîz/: ناو. گرێزە؛ لیک؛ لیکاو؛ ئـاوێ کـە لە ڕەخی دەمەوە دێت ⚑ لعاب دهان

**گریزانک** / /g(i)rîzanik/: ناو. ڕەوتی لەرزینی لەپـڕ ⚑ چندش

**گریزە** / /g(i)rîze/: ناو. مچـوڕک؛ موچـڕک؛ ڕەوتی لەرزینی زۆر کەم لەپڕدا ⚑ مورمور

**گریس**[١] / /g(i)rîs/: نـاو. ماکی نیوەگرسی دەڵەمە بۆ ڕەوانســازی بەشــگەلی لەجووڵــەی ماشــین ⚑ گریس

**گریس**[٢]: ئاوەڵناو. سست و شل ⚑ شُل و وِل

**گریسکاری** / /g(i)rîskarî/: نـاو. کارو ڕەوتی ساوینی گـریس بـە پاژگـەلی لـەجووڵـەی ماشـیندا ⚑ گریسکاری

**گریش** / /g(i)rîş/: نـاو. ١. تیتـۆڵ؛ پەڕوەکۆنــە ٢. گیشەی گیا و دەخڵی لە دەشـت ⚑ ١. کُهنـه ٢. بسته‌های گیاه و غله‌ی جمع‌آوری نشده

**گریشمە** / /g(i)rîşme/: ☜ **گرشمە**

**گریڤ** / /g(i)rîv/: ناو. مـان؛ جەنـە؛ گـە؛ گـەی ⚑ اعتصاب

**گریڤان** / /g(i)rîvan/: ☜ **گریوان**

**گریڤکەر** / /g(i)rîvker/: ناو. مانگرتوو ⚑ اعتصابی

**گریک** / /g(i)rîk/: نـاو. گرک؛ تابشت؛ توان؛ تاقـەت ⚑ تاب و توان

**گریم**[١] / /g(i)rîm/: ناو. گۆڕانی شێوەی سەر و چـاو بە شێوەی دڵخواز، پتر بۆ بەرێوە بـردنی شـانۆ ⚑ گریم

**گریم**[٢]: ☜ **گریمان**

**گریمـان**[١] / /g(i)rîman/: نـاو. فـەرز؛ گـریم؛ گـیرام؛ گیرەم؛ دۆخی وا دانان ‹گریمانەکەی تۆ بـە ڕاسـت دەرچوو› ⚑ فرض

**گریمان**[٢]: ئاوەڵکار. گریم؛ گیرام؛ گیرەم؛ وامان دانـا ‹گریمان بابت وەزیری شا بێ› ⚑ گیرم

**گریمانە** / /g(i)rîmane/: نـاو. ١. گرێی زۆر لە بـەن و دەزوودا ‹ئـــەم دەزووە تێکـــڕا گریمانەیـــە› ٢. *[دەروونناسی]* گرێ؛ بیر، بیرەوەری یان خوازەیەک کە بە تـەواوی یـان بەشـێکی سـەرکوت‌کـراوە و هەست و سۆزی ئەو کەسەی ئاوێتە بووە و لەگەڵ بـیر و بۆچوونـەکانی دیکەیـدا لـە دژایـەتی و مشت‌ومڕدایە ‹دەروونی پڕ گریمانە و حەسـەد بـوو/ هەتا حەز کەی بەخیل و شووم و بەد بـوو «هـێمن»› ٣. بۆچوونێ کە بۆ بەدەست هێنانی بەرهەم یـان ئەزموونێک لە بەر چاو گیراوە ‹گریمانـەی شـەڕی ناوخۆ› ٤. بڕوا یان حوکمی نەسەلمێندراو کە بـۆ دۆزینـەوەی سـەرچاوە یـان هـۆی دیاردەیـەک پەسند دەکرێ ‹سـێ گریمانـە بـۆ لـە نـاو چـوونی جیهان› ⚑ ١. گره‌خوردگی نخ ٢. عُقده ٣و۴. فرضیه

**گرین** / /g(i)rîn/: ☜ **گریان**

⊡ **کردنە گرینەوە** ☜ **کردنە گریان(ـەوە)**

**گرینای** / /g(i)rînay/: چاوگ. کوڵاندن؛ کـوڵانن ⚑ جوش آوردن

**گرینج** / g(i)rînc/: ☜ **گرنج**

**گرینچۆ** / g(i)rînço/: ناو. جمگە؛ جومگە ☰ مفصل

**گرینگ** / g(i)rîng/: ☜ **گرنگ**

**گرینگی** / g(i)rîngî/: ☜ **گرنگی**

**گرینـۆک** / g(i)rînok/: ئاوەڵـناو. [پـلار] گـرۆک؛ تایبەتمەندی کەسێ کە زوو دەبێتە گریانەوە یان زۆر دەگری ☰ خوش‌گریە

**گریـوان** / g(i)rîwan/: نـاو. گریڤـان؛ ژێرکـراس؛ کراس‌ئاسایەککە لە بن کراسەوە دەبەردەکرێ ☰ زیرپیراهن

**گریوە** / g(i)rîwe/: ☜ **گری**[1]

**گریە** / girye/: ☜ **گری**[1]

**گریەورۆ** / girye w řo/: ☜ **گریەورۆرۆ**

**گریەورۆرۆ** / girye w řořo/: ناو. گریەورۆ؛ شیوەن و شەپۆر ☰ شیون و زاری

**گریـەوگۆ** / girye w go/: نـاو. شـیوەن و دەردەدڵ ☰ گریە و درددل

**گرێ** / g(i)rê/: ناو. ١. گرە؛ گرێک؛ بەند؛ چۆنیەتی ئاڵۆز بوون و لێک‌گیرانی یـەک یـا چەنـد هـەودا پێکەوە ٢. بەنـدی گیـا، (وەک: قـامیش و ...) ٣. لک؛ لکە؛ گچ؛ شوێنی دەرهاتنی لق لـە کۆتـەی دار ٤. گەی قامک؛ بەندی تبل ٥. لک؛ لۆ؛ لـوی ‹گرێی شێرپەنجە› ٦. گریمانە ‹گرێ سەر دڵ› ٧. پاژێک لـە شـازدە پـاژی گـەزی پێـوان ٨. گـرە؛ یەکەی درێژایی لە دەریا بەرامبەر بە یەک میلـی دەریایی ٩. [مەجاز] کێشە؛ گرفت؛ ئەوەی ئەستەم چـارە بـێ ‹چەنـد جـار گـرێ هاتـە سـەر رێـی کارەکەمان› ☰ ١. گره ٢. بند گیاه (مانند: نی و...) ٣. گـره درخـت ۴. بنـد انگشـتان ۵. غُـده ۶. عُقـده ۷. یـک‌شـانزدهم ذرع شـاهی ۸. گـره دریـایی ۹. گـره؛ مشکل

◙ **گرێ بەرانە**: جۆرێ گرێ کـە تونـد نابـێ و بـە هاسانی دەکرێتەوە ☰ نوعی گره کـە آسـان بـاز می‌شود

**گرێ پووچکە**: گرێشک؛ گرێ کوتک؛ گرێ کۆرە؛ گرێیەکوێرە؛ گرێیەک بە دژواری دەکرێتەوە ☰ گره کور

**گرێ جوانە**: گرێ جوولەکانە؛ جۆرێ گـرێ کـە فێر بوونی دژوارە ☰ نوعی گره پیچیده

**گرێ جوولەکانە**: ☜ **گرێ جوانە**

**گرێ کوتک**: ☜ **گرێ پووچکە**

**گرێ کوێرە**: ☜ **گرێ پووچکە**

**گرێ کۆرە**: ☜ **گرێ پووچکە**

◙ **گرێ تێکەوتن** گـرێ خـواردن: ١. ئاڵـۆزان و لێک‌گـیران ٢. [کینایە] هـەبلین؛ ئاڵـۆز بـوون؛ گێچەڵ تێکەوتن ‹گرێ کەوتـە نـاو کارەکـە› ☰ ١و٢. گره خوردن

**گرێ خواردن**: ☜ **گرێ تێکەوتن**

**گرێ دان** گرێ لێدان: ١. توند لێک‌بەسـتن ٢. [کینایە] دەبەر کردنی ئەسپابی شەڕ یان سەفەر ٣. [مەجاز] بێدەنگ بوون؛ لێ‌برینەوە ‹ئـەرێ تـۆ بۆ گرێی نادەی؟ خۆ مێشکمان تەقی!› ☰ ١. گـره زدن ٢. پوشیدن لباس رزم یا سفر ٣. ساکت شدن

**گرێ کردنـەوە** ١. هەڵوەشـاندنەوەی گـرێ ٢. [کینایە] چارە کردنی گیر و گرفت ☰ ١و٢. گره را باز کردن

**گرێ لێدان**: ☜ **گرێ دان**

**گرێی بەخت کرانەوە** [کینایە] شوو کردنی کچێکی قەیرە ☰ بخت باز شدن؛ شوهر کردن پیردختر

**سەر بەنێ گرێ دان**: [کینایە] کارێکێ کـەم، بـەڵام باش کردن ☰ کاری کوچک، اما مفید کردن

**گرێبەسـت**[1] / g(i)rêbest/: نـاو. ١. بڕیارنامـەـە؛ پەیمان‌نامە؛ بەڵێنێکی (پتر نووسراوە) کە بـە پێـی ئەوە دوو یان چەند لایـەن مافـێ بـۆ یـەکتر بـە ڕەسمی دەناسن یا لە هەمبـەر یـەکترەوە کـار و ئـەرکێ وە ئەسـتۆ دەگـرن ٢. کیسەپوولـی

سەردەمی پێشوو ■ ١. قرارداد ٢. کیسەی پول در گذشته

**گرێبەست**[٢]: ئاوەڵناو. پەیمانی؛ بڕیاری؛ بە گوێرەی گرێبەست ‹مامۆستای گرێبەست› ■ قراردادی

**گرێبەند** / g(i)rêbend/: ناو. ڕاپۆرت؛ هەوای بە نووسین ‹گرێبەندا خۆ بگۆرا دلێ ئاغە نڤیست› ■ راپُرت؛ گزارش کتبی

**گرێجان** / g(i)rêcan/: ئاوەڵناو. ناکەس؛ خاوەن خدە و خووی ناشیرین ■ بداخلاق

**گرێجەنە** / g(i)rêcene/: ☚ **گرێژەنە**

**گرێچ** / g(i)rêç/: ناو. هەراوهوریا؛ زەنازەنا ■ داد و فریاد

**گرێچک** / g(i)rêçik/: ناو. بەندی قامک ■ بند انگشت

**گرێچن**[١] / g(i)rêçin/: ناو. ١. جۆرێ تەنینی بە گرێ لە سەر گرێ ٢. چەشنێ بەستنی پشتێند کە ناوەڕاستی قەدەکانی بە گرێ دەوەستێ ■ ١. گرەبافت ٢. نوعی بستن شال

**گرێچن**[٢]: ئاوەڵناو. بە گرێ تەنراو ‹زەحمەتە ناکرێتەوە هەرگیز گرێی بەختم بە کەس/ دەستی حەق ئەم ڕشتەیەی یەکسەر گرێچن کردووە «کەمالی»› ■ گرەبافت

**گرێدار**[١] / g(i)rêdar/: ناو. پێچ و ڕەقایی لە مێشکی داردا ■ گره میان تنەی درخت

**گرێدار**[٢]: ئاوەڵناو. بەگرێ؛ خاوەن بەند ■ دارای بند

**گرێدانک** / g(i)rêdanik/: ناو. ١. پەیمان؛ بڕیار؛ دۆخی پێکهاتنی دوو یا چەند لایەن بو جێبەجێ کردنی کارێک یان بەرێوە بردنی بڕیارێک ٢. دۆخی شوێنەواری مێژوویی بەجێ هێشتن ■ ١. عهد؛ پیمان ٢. وضعیت اثر تاریخی به جا گذاشتن

**گرێدای** / g(i)rêday/: ئاوەڵناو. بەندیوار؛ پێوەندیدار؛ گرێدراو ■ وابسته

**گرێدراو** / g(i)rêd(i)raw/: ئاوەڵناو. ١. بەندکراو (دەزوو) ٢. داخراو (درگا) ■ ١. گرەزده ٢. بسته (در)

**گرێزە** / g(i)rêze/: ☚ **گرێز**

**گرێژ** / g(i)rêj/: ☚ **گوان**[٢]

**گرێژنە** / g(i)rêjne/: ☚ **گرێژەنە**

▣ **لە گرێژنە دەرچوون**: لە گرێژنە دەرهاتن؛ شێوان و لە سەر باری خۆ نەمان ‹دۆخی ئابووری لە گرێژنە دەرچووە› ■ از پاشنه دررفتن

**لە گرێژنە دەرهاتن**: ☚ **لە گرێژنە دەرچوون**

**گرێژەنە** / g(i)rêjene/: ناو. گرێژنە؛ گرێجەنە؛ گیژن؛ گێجەنە؛ گێژەنە؛ بنڕێسمە؛ پاژنەی دەرگا؛ ژێرڕێسمە ■ پاشنەی در

**گرێشک** / g(i)rêşk/: ☚ **گرێ پووچکە**

**گرێقامیش** / g(i)rêqamîş/: ناو. گرنچک؛ بەندی قامیش ■ بند نی

**گرێک** / g(i)rêk/: ☚ **گرێ-١**

**گرێ‌گورێس** / girêgurês/: ناو. *[کینایە، پلار]* خواردەمەنی وشک و زرو کە دژوار قووت بدرێ. هەروەها: **گرێ‌گورێس قووت دان** ■ خوراکی خُشک و زِبر

**گرێل** / g(i)rêl/: ناو. باگردان؛ بانگلێر؛ بانگلان ■ بامغلتان

**گرێلە** / g(i)rêle/: ناو. گرێی پچووکی دوای دەزووی درووما ن ‹تەڕ بە تەڕی سەر بە گرێلە «مەسەل»› ■ گره کوچک دنبالەی نخ دوختنی

**گرێمی** / g(i)rêmî/: ☚ **گرێنی**

**گرێنی** / g(i)rênî/: ناو. گرێمی؛ جۆرێ خەنجەری گچکە ■ نوعی خنجر کوچک

**گرێو** / g(i)rêw/: ناو. گرۆ؛ گرەو؛ گورۆ: ١. مەرج؛ شەرت ٢. بارمتە ■ ١. شرطبندی ٢. گروگان

**گرێ‌وگۆڵ** / g(i)rê w goł/: ناو. ١. ئالۆزی و گرێی زۆر دە بەندا ٢. *[کینایە]* کارێ کە سەرەودەر ناکرێ ‹وات کردە گرێ‌وگۆڵ هەر سەری لێ دەرناکەم!› ■ ١. درهم‌برهمی و گره زیاد ٢.

سردرگمی

**گرێوەغار** /g(i)rêweğar/: ناو. کێبەرکێی ڕاکـردن ☰ مسابقەی دو

**گرێیەکوێرە** /g(i)rêyek(i)wêre/: ☜ **گرێ پووچکە**

**گڕ**[1] /giř/: ناو. ١. ئاور؛ ئاگر ‹گڕی گرت› ٢. بلێسە ‹گڕی ئاگر بەرزە› ٣. تین؛ گەرما ‹لە گڕی هاویندا› ٤. هەست و تین ‹زۆر کەڕەت هانم ئەدا داخی دەروونی پڕ گڕم/ بۆتی هەڵڕێژم سکاڵای ناسکی گەرم و گوڕم «هەردی»› ٥. ئاوی گەرمەکانی ٦. تاو؛ دەمێکی کەم ‹گڕێ لێرە بوو، چوو› ٧. پەلپی زارۆک ‹گڕی داگرتگە› ٨. چەرخ؛ خول ‹لە دەور ماڵمان گڕ ئەخوا› ☰ ١. آتش ٢. شعله ٣. شدت گرما ۴. احساسات ۵. آب گرم معدنی ۶ آن؛ لحظه ۷. بهانەی بچە ٨ چرخ

⊡ **گڕ تێ بەر بون**: ١. ئاگر گرتن ٢. *[کنایە]* بەرز بوونەوەی هەستی دەروونی بۆ شتێک (وەک سۆز، تامەزرۆیی) ☰ ١. آتش گرفتن ٢. احساساتی شدن

**گڕ تێ بەر دان**: ١. ئاگر دان ٢. *[کنایە]* بەرز کردنەوەی هەستی دەروونی بۆ شتێک (وەک سۆز، تامەزرۆیی) ☰ ١. آتش زدن ٢. احساساتی کردن

**گڕ خواردن**: خول خواردن؛ هەڵچەرخان؛ بە دەوردا سووڕانەوە ☰ چرخیدن

**گڕ داگرتن**: پەلپ گرتنی منداڵ ☰ بهانە گرفتن بچە

**گڕ دامرکان**: ١. کوژانەوەی ئاگر ٢. *[کنایە]* شکان و تیر بوونی حەز و ئارەزوو ☰ ١. فروکش کردن آتش ٢. فروکش کردن احساسات

**گڕ دان**: ١. ئاور تێبەردان ٢. خولانەوە ٣. سووڕانەوە ٤. دیتن و قت کردنی کەسێ لە چاوشارکێدا ☰ ١. آتش زدن ٢. گشتن ٣. چرخیدن ۴. دیدن و خارج کردن کسی در بازی قایم‌موشک

**گڕ گرتن**: ١. گڕ تێبەر بوون؛ هەڵبوونی ئاگر ٢. *[کنایە]* ڕک هەستانی زۆر ‹لەو قسەیە گڕی گرت› ☰ ١. شعله‌ور شدن ٢. به خشم آمدن

**گڕ**[2]: ئاوەڵناو. ١. زبر؛ قونجر ـ قونجر ‹بەردی گڕ› ٢. زبر (بۆ دەنگ) ‹بە دەنگێکی گڕ بانگی کرد› ٣. زل و زەق؛ گەورە ‹ددان گڕ› ٤. گەڕ؛ گەڕۆڵ ☰ ١. زبر ٢. خشن ٣. گُنده ۴. کَل

**گڕ**[3]: ئاوەڵکار. دیسانەکە؛ دووبارە ‹ڕۆیشت، گڕ هاتەوە لای خۆمان› ☰ باز؛ دوباره

**گڕ**[4]: سارستە. وشەیەکە لە کایەی چاوشارکێدا دەگوترێ. هەروەها: **گڕ کردن** ☰ اصطلاحی در قایم‌موشک بازی

**گڕ**-[5]: پێشوشە. گەرم؛ بەتین ‹گڕاو› ☰ گرم

-**گڕ**[6]: پاشەوشە. ئاوربەر ‹خۆشگڕ؛ دیرگڕ› ☰ آتش‌گیر

**گڕاگر** /g(i)řagir/: ناو. کڵپە و بلێسەی ئاور ☰ شعله‌های آتش

**گڕاڵک** /g(i)řaḣk/: ناو. گراڵک؛ سمیتک؛ پنجی وشکی گیایەکە، دەیکوڵێنن، ئاوەکەی دەرمانی زیپکە و ئاڵۆشی لەشە ☰ بوته‌ای دارویی

**گڕام** /g(i)řam/: ☜ **گرەم**

**گڕامافۆن** /g(i)řamafon/: ☜ **گرامافۆن**

**گڕان**[1] /g(i)řan/: چاوگ. تینەپەر. //گڕای؛ دەگڕێی؛ بگڕێ// گڕیان: ١. کڵپە کردن؛ بلێسەدار بوون ٢. ڕۆشن بوون ‹چراکەیان ئەگڕێ› ☰ ١. مُشتعل بودن/ شدن ٢. روشن بودن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: گڕاو/ چاوگی نەرێنی: نەگڕان

**گڕان**[2]: ناو. ١. کرە؛ ئاسیاوی چەڵتووک و پەڕش لێکردن ٢. بیرازی بەرداش ٣. کوتکی زلی ئاسن بۆ بەرد شکاندن ☰ ١. آسیاب شالیکوبی ٢. از ابزارهای آسیاب ٣. پُتک سنگ‌شکن

**گڕاندن** /g(i)řandin/: چاوگ. تێپەر. //گڕاندت؛

دەگرێنی؛ بگرێنه// ١. کرە کردن بە دەستاڕ یان بە ئاشی کرە، چەڵتووک لێ کردن ٢. خۆش کردنی ئاور؛ بڵێسەدار کردنی ئاگر ⇐ ١. نیمکوب کردن ٢. شعلەور کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەگراندن

**گڕانه** / g(i)řane/: ناو. ١. ڕووتیی سەر ٢. گرنگی؛ گرینگی ٣. یەخە؛ بەربینگ ⇐ ١. طاسی سر ٢. اهمیت ٣. یقه

**گڕاو**[1] / g(i)řaw/: ناو. گەرمکاو؛ کانیاوێ کە گازی هەیە و گەرمە و بۆ دەرمانی خوروو دەبێ ⇐ چشمەی آب معدنی

**گڕاو**[2]: ئاوەڵناو. بە بڵێسە کراو ⇐ شعلەور شده

**گڕای** / g(i)řay/: چاوگ. گڕان؛ گڕیان ⇐ مُشتعل بودن؛ روشن بودن

**گڕپە**[1] / giřpe/: ناو. گڕ؛ کڵپە؛ بڵێسە ‹کزەی چزەی زام گڕپە و گڕەی دڵ/ داخ دووری دۆس دوور کەفتەی مەنزڵ «مەولەوی»› ⇐ شعلەی آتش

**گڕپە**[2]: دەنگەناو. دەنگی هەڵبوونی ئاگری بەرز ⇐ صدای مُشتعل شدن

**گڕتێچو** / giřtêçû/: ئاوەڵناو. داگرساو؛ داگیرساو ⇐ مُشتعل

**گڕسۆز** / giřsoz/: ناو. جۆرێک لامپای شیشە باریک ⇐ چراغ گردسوز

**گڕک** / g(i)řik/: ناو. ١. دەستاڕ؛ هاڕە؛ ئاشی دەستی ٢. جوون؛ بەردی قووڵی شت تێدا کوتان ⇐ ١. دستاس ٢. سنگ گود بە جای هاون سنگی

**گڕکان** / giřkan/: ناو. ئاگرپژێن؛ ئاگرپشان؛ ئاگری؛ بورکان؛ ئارکان؛ قۆڵکان؛ نووره؛ چیای سەر بە ئاگر ⇐ آتشفشان

**گڕکه** / giřke/: ناو. ١. گڕکەک؛ خرچەی خڕی لاقوپاو کە گۆشتەکەی ئاودار و هێندێک شیرینە ٢. کەچەڵیی ئاژەڵ ٣. قاقڕ؛ کڕاڵ ⇐ ١. گرمک ٢. کچلی احشام ٣. زمین لم‌یزرع

**گڕکەتاڵ** / giřketał/: ناو. تەهلک؛ تاڵک؛ فرچەتاڵ ⇐ خربزه و طالبی نرسیده و تلخ

**گڕکەک** / giřkek/: ☜ **گڕکه ـ١**

**گڕگر** / giřgir/: ئاوەڵناو. ١. گەورەپیاو ٢. لەبار بۆ ئاور تێ بەربوون ⇐ ١. بزرگمرد ٢. قابل اشتعال

**گڕگرتوو** / giřgirtû/: ئاوەڵناو. پەلۆخ؛ داگرساو؛ گڕتێچوو ⇐ مُشتعل

**گڕگڕ**[1] / giřgiř/: ناو. ١. جۆرێ پاقلە ٢. گڕی لەسەریەکی ئاگر ‹گڕگڕ دایسا› ⇐ ١. نوعی باقلا ٢. شعلەی مداوم

**گڕەگڕ**[2]: ئاوەڵکار. خول ـ خول؛ دیسانەوە بە پەلە ‹هەر دەڕوا و گڕ ـ گڕ خۆ بە ماڵدا دەکاتەوە› ⇐ باز باعجله

**گڕگڕان** / giřgřan/: ناو. ئاگربازی؛ ئاتەشبازی ⇐ آتشبازی

**گڕگڕە** / giřg(i)ře/: ناو. جەغجەغە؛ چەرخی ئاو هەڵکێشان لە بیر ⇐ چرخ چاه

**گڕگێچەڵ** / giř gêçeł/: ☜ **گەڕوگێچەڵ**

**گڕمه** / giřme/: ناو. تەر؛ کەمرە؛ گەمڕە ⇐ سرگین خشک‌شده

**گڕناڵ** / giřnał/: ئاوەڵناو. زبر؛ گرنۆر ⇐ زبر

**گڕنای** / giřnay/: چاوگ. گڕ دان؛ ئاور دان ⇐ بە آتش کشیدن؛ آتش زدن

**گڕنژین** / g(i)řinjîn/: چاوگ. ١. چرچ و لۆچ بوون ٢. هەڵقرچان؛ بە هۆی گەرماوە چوونەیەک ⇐ ١. چروکیدن ٢. در اثر حرارت بە هم آمدن

**گڕنۆز** / giřnoz/: ئاوەڵناو. ١. کەڕواوی؛ برشاوی ٢. بەکرێژ ⇐ ١. کپک‌زده ٢. شوره‌زده

**گڕنه** / giřne/: ناو. پەلپ؛ بەهانە؛ بیانک؛ بیانوو ⇐ بهانه

⊡ **گڕنە گرتن**: پەلپ گرتن و بەهانە دۆزینەوەی منداڵ بە گریانەوە ⇐ بهانه گرفتن بچه

**گڕنەگر** / giřnegir/: ئاوەڵناو. بەپیلە؛ بەپچەڵ؛

بیانووگر ☳ بهانەگیر

**گرنەوت** / girňewt/: ناو. جەنگەی جووت بوونی پشیلەی نێر و مێ ☳ موسم جفتگیری گربه

**گرنی**[١] / girňî/: ناو. گغنی؛ گەڕ: ١. بە دزییەوە لە شتێ ڕوانین بۆ دۆزینەوەی وەرامی پرسیار یا مەتەڵێ ٢. فێڵ و گزی ☳ ١. تقلب ٢. حیله

**گرنی**[٢]: ناوەڵناو. ١. زرو؛ زبر لە دەست لێدانـدا ٢. پەڵپگر ٣. ☜ **گرنیباز** ☳ ١. زبر ٢. بهانەگیر ٣. ☜ **گرنیباز**

**گرنیباز** / girňîbaz/: ناوەڵناو. گرنی؛ گزەون؛ گزیکار؛ فێڵباز ☳ حیلەگر

**گرنیگرنی** / girňî girňî/: ناوەڵناو. زبر ‹ئەو لایەی سافە، بەڵام لاکەی تری گرنیگرنییە› ☳ زبر

**گرۆبەندە** / giř û bende/: ناوەڵناو. زۆر ئازا لە شەڕ و جەنگدا ☳ سلحشور

**گرۆپف** / giř û pif/: ناو. گروفک: ١. چۆنیەتی سەرڕێژ کردن و نیشتنەوەی شێو لە دیزەدا ٢. چۆنیەتی لەپڕ بەرزەوە بوون و دامرکانی گڕ ٣. [کینایە] کاتی بوون ‹دە دلی مەگرە! تووڕە بوونی کاکت گرۆپفێکە!› ٤. [کینایە] چۆنیەتی لەپڕ دەوڵەمەند یا بەدەسەڵات بوون و زوو نابوود بوون ☳ ١. سرریز کردن و فرونشستن جوشیده ٢. حالت ناگهان شعلەور شدن و زود خاموش شدن ٣. وضع یا حالت یکباره برآشفتن و به سرعت آرام شدن ٤. دولت مُستعجل

**گرۆفڕ**[١] / giř û fiř/: ناو. ١. کڵپەی لەپڕ و نەکاو ٢. شاتوشووت ☳ ١. شعلەی ناگهانی ٢. لاف و خودستایی

**گرۆفڕ**[٢]: ناوەڵناو. تایبەتمەندی شتێ کە زوو بفەوتێ ☳ سریع‌الزّوال

**گرۆفک** / giř û fik/: ☜ **گرۆپف**

**گرۆگاڵ** / giř û gał/: دەنگەناو. گاڵوبوغ؛ گاڵوبۆغ؛ دەنگ و قسەی زارۆی ساوا کە تازە زوان دەگرێ ☳ غان‌وغون

**گرۆگر** / giřugir/: ناوەڵناو. ورکاوی؛ پەڵپگر ☳ بهانەگیر

**گرۆگرپە** / giř û girpe/: ناو. ئاگر و تین ☳ آتش و حرارت

**گرۆگێچەڵ** / giř û gêçeł/: ☜ **گەڕوگێچەڵ**

**گرۆێ**[١] / giřwê/: ☜ **گەڕی**

**گرۆێ**[٢]: ناوەڵناو. گەڕۆڵ؛ گوڕوو؛ گڕوو؛ گوڕی؛ گەڕل؛ گەڕەڵ؛ کرووز؛ گول ☳ گَر؛ مبتلا به گال

**گرۆێیی** / giřwêyî/: ناو. نەخۆشی گڕوو بوون ☳ بیماری گری

**گڕۆز** / g(i)řoz/: ناوەڵناو. گرەزۆک؛ گرۆز؛ گڕووگر ☳ همیشه گریان و بهانەگیر

**گرۆلە** / g(i)řole/: ☜ **گرۆڵ**

**گرۆڵی** / g(i)řołî/: ناو. گوللە؛ بەرکی چەکی گەرم ☳ گلولەی اسلحه

**گرۆڵیە** / g(i)řołye/: ناو. ١. ☜ **کلۆلە**[١]ـ١ ٢. گوللە؛ بەرکی تفەنگ ☳ ١. ☜ **کلۆلە**[١]ـ١ ٢. گلولەی تفنگ

**گرو**[١] / g(i)řû/: ناو. ١. ☜ **گەڕی** ٢. گڕی ئاگر ٣. پەڵپ؛ بیانوو ☳ ١. ☜ **گەڕی** ٢. شعلەی آتش ٣. بهانه

⊡ **گرو گرتن**: پەڵپ گرتنی ☳ بهانه گرفتن

**گرو**[٢]: ناوەڵناو. ڕوخسار ئاوڵاوی ☳ آبلەرو

**گروگر** / g(i)řûgir/: ناوەڵناو. بیانکواز؛ بیانووگر ☳ بهانەگیر

**گرە** / g(i)ře/: ناو. ١. سەموون؛ بای گەرمی کوشندە ٢. تین و هاڵاو ٣. دەنگی زبری ناخۆش ٤. کرەی دەخڵ ☳ ١. بادسام ٢. هُرم گرما ٣. صدای خشنِ گوش‌خراش ٤. نیمکوبی دانه

**گرەبا** / giřeba/: ناو. ژەهرەبا؛ سەبوون؛ هورە ☳ باد گرم

**گرەبەرد** / g(i)řeberd/: ناو. بەردی زبر و زۆپی کێو

🇮🇷 سنگ زبر و برجسته در کوه
**گرەپێچە** / g(i)řepêçe/: نـاو. گـری تونـد و بەتەوژمی تەندوور 🇮🇷 شعلەی پرحجم تنور
**گرەزۆك** / g(i)řezok/: ☜ **گرۆز**
**گرەژۆ** / g(i)řejo/: ناو. گەڵارێزان؛ خـەزەڵوەریـن 🇮🇷 برگریزان
**گرەسیسە** / g(i)řesîse/: ناو. دوامین گری تەنـدوور 🇮🇷 آخرین شعلەهای تنور
**گرەگـر**[1] / g(i)řegiř/: نـاو. ١. گرگـر؛ کلـپەی بەردەوامی ئاگر ٢. دەنگی زبری ناخۆش ‹شـتێک گرەگر دەکـا و دەڕوا› 🇮🇷 ١. لهیـب مـداوم آتـش ٢. صدای زبر و خشن
**گرەگر**[2]: ئاوەڵکار. بە دەنگی زبری ناخۆشەوە ‹کـابرا گرەگر شتێکی گوت و چوو› 🇮🇷 با صدای خشن
**گرەگر**[3]: دەنگەناو. زەنا ـ زەنا و چەقەچـەق 🇮🇷 داد و قال
**گری** / g(i)řî/: نـاو. ١. زرووی؛ زبـری لـە دەسـت لێداندا ٢. دۆخی دیار بـوونی ددانی پێشـەوە ٣. زبـری دەنـگ 🇮🇷 ١. زبـری؛ آجیـدگی ٢. نمـود دندان‌های پیشین ٣. زبری صدا
**گریاڵ** / gřyał/: ئاوەڵناو. کەچەڵ 🇮🇷 کچل
**گریان** / giřyan/: ☜ **گران**[1]
**گریای** / giřyay/: چاوگ. گران 🇮🇷 مُشتعل بودن
**گریهتك** / g(i)řîhtik/: ناو. ١. کێڵگە لە نـاو دۆڵ و شیودا ٢. ☜ **گەری** 🇮🇷 ١. مزرعەی واقع در دره ٢. ☜ **گەری**
**گرێ** / g(i)řê/: ئاوەڵکار. تاوێ ‹گرێ لێرە بوو، چوو› 🇮🇷 لختی
**گرێش** / g(i)řêş/: ناو. تیتۆڵ؛ بزگوری جلـی کـۆن 🇮🇷 کهنه
**گرێل** / g(i)řêl/: ناو. جۆرێ بەری مـازوو 🇮🇷 نـوعی ثمر مازوج
**گز**[1] / giz/: نـاو. ١. گـزی؛ حیلـە؛ فـێڵ ٢. بـزی؛ چاوزەقی ٣. ☜ **گـەز**[1]**ــ١** 🇮🇷 ١. حیلـە ٢. چشـم‌برجستگی ٣. ☜ **گەز**[1]**ـ١**
⊡ **گز کردن**: فێڵ کردن ‹گوێزی نـەماوە، گـز ئـەکا! «مەسەل»› 🇮🇷 حیله کردن
**گز**[2]: ئاوەڵناو. ١. ئالوودە؛ خووگرتوو ‹ئەم کابرایە گـز ئارەق و قومارە› ٢. بە عەزرەت و ئـاوات ‹گـز ئـەو ڕۆژەم تۆ ببینم› 🇮🇷 ١. خوگرفته ٢. مُشتاق
**گز**[3]: ئاوەڵکار. لەپڕ و نەکاو 🇮🇷 ناگهانی
**گز**[4]: دەنگەناو. دەنگی کیسەڵی نێر بـۆ تـاو کـردنی مێیینەکەی 🇮🇷 صدای لاکپشت نر هنگام جفتگیری
**گز**[5]: سارستە. دەستەواژەیەکە لە کاشۆ بازیـدا واتـا: وشـیار بـە لـە سـەر ڕێ و شـوێن کایـە بکـە 🇮🇷 اصطلاحی در چوگان بازی
**گزارە** / g(i)zare/: نـاو. ئەسـتووری؛ کولـوفتی 🇮🇷 کُلُفتی؛ ستبری
**گزاندن** / g(i)zandin/: چاوگ. وزانـدن؛ گیزەگیـز کردن 🇮🇷 وِز- وز کردن
**گزجـاڕ** / gizcař/: نـاو. بێشـەی دەوەنی گـز 🇮🇷 گزستان
**گزچار** / gizçar/: ☜ **گەز**[1]**ـ١**
**گزدەر** / gizder/: ئاوەڵناو. داوباز؛ گزیکار؛ گزەوون 🇮🇷 حُقەباز
**گزر** / g(i)zir/: ☜ **گیزەر-١**
**گزرانۆك** / gizranok/: نـاو. پرچـی وەهۆنـدراو 🇮🇷 زُلف بافته
**گزرە** / gizre/: ناو. ١. گیای وردکـراو بـۆ لـەوەڕی ئاژەڵ ٢. داری پارچە ـپارچـەکراو بـۆ سـووتانی زستانە ٣. پووش و پـار 🇮🇷 ١. گیـاە کوبیـدە بـرای علوفەی دام ٢. هیـزم قطعـەقطعـە شـدە ٣. خـس و خاشاک
**گزڤانۆك** / gizvanok/: نـاو. پرچی هۆندراو 🇮🇷 زلف تاب‌دادە
**گزك** / gizik/: ☜ **گسك**

⊡ **گزک دان:** ☜ **گسك دان**

**گزکچه** / giz(i)kçe/: ناو. بەتارە؛ فلـچە ☰ فرچـەی سریش‌زنی جولا

**گزکدەر** / gizikder/: ☜ **گسکدەر**

**گزکنە** / gizk(i)ne/: ئاوەلـناو. ١. پرپشـت؛ زۆر پـڕ (کـەزی) ٢. پـڕلق و پـۆپ (دار) ☰ ١. پُرپشـت ٢. پُرشاخ و برگ

**گزگ** / gizig/: ☜ **گسك**

**گزگجاڕ** / giz(i)gcař/: ناو. جارەگسک؛ زەوینێ کە گەسکی لێ بڕوێ ☰ گزستان

**گزگدەر** / gizigder/: ☜ **گسکدەر**

**گزگز**[١] / gizgiz/: نـاو. ١. قـانوون و ڕێوشـوێنی یاری ٢. تەزوو؛ لەرزێکی کەم ☰ ١. اصول و آداب بازی ٢. مورمور

**گزگز**[٢]: دەنگەناو. ١. گز؛ دەنگی کیسەڵی نێر بۆ تاو کردنی مێوینە ٢. چزەچزی گۆشت لە سەر ئـاگر ☰ ١. صدای لاکپشـت نـر در جفتگیـری ٢. صـدای گوشت بر آتش

**گزگزانـدن** / gizg(i)zandin/: چـاوگ. کـەمێک لەرزاندنەوە ☰ اندکی لرزاندن

**گزگـزە** / gizg(i)ze/: نـاو. ١. ☜ گـەزنە _٣ ٢. گیایـەکی گـەڵاباریکی بۆنخۆشـە بنەکـەی بـۆ سووتاندن دەبێ ٣. شیشە؛ شووشە ٤. مۆز؛ مێشە گزگـزە؛ جۆرێـک مێشـی سـەوزی گەورەیـە بـە ئاژەڵەوە ئەدا ☰ ١. ☜ **گەزنە_٣** ٢. گیاهی اسـت ٣. شیشه ٤. خرمگس سبز رنگ

**گزگزین** / gizg(i)zîn/: چاوگ. سـووکە لـەرزین؛ تەزین لە بەر هێز خستنە سەر ئەندامێک یان زۆر مانەوە لە سەری ☰ مورمور شدن

**گزگل** / gizgil/: نـاو. ١. قەل؛ قەلەموونە؛ عەلۆعەلۆ؛ عەلەشـیش ٢. بـەرێکی دار مـازووە ‹گزگـل، زوو دەکەوێتـە تـل «مەسـەل»› ٣. */پلار/* باوەعـەمرە؛ بـاوەقۆرەت؛ چلـەنۆک ☰ ١. بوقلمـون ٢. یکـی از ثمرهای مازوج ٣. کوتوله

**گزگلاگە** / gizg(i)lage/: نـاو. پێشەی پشتی گـوێ ☰ استخوان پُشت گوش

**گزگەتوڵین** / gizgetûłîn/: ☜ **شیرخشت**

**گزگی** / gizgî/: ناو. ئاوێنە؛ ئاینە؛ قودیک ☰ آیینه

**گزم**[١] / gizm/: ☜ **گەز[١]_١**

**گزم**[٢]: ئاوەلناو. زبر؛ زرو ☰ خشن؛ زبر

**گزمک** / gizmik/: ناو. دەمبێنی حەیوان ☰ پوزەبند

**گزموله** / gizmûle/: ناو. ١. هـەر شـتێکی خـڕی چکۆلە ‹گزمووله قوڕی وەک بەردیان تێ دەگردن، تا بە دەردی کایەکی خوراوی بردن «هـەژار، *قورئان*»› ٢. کەلای گڵی ☰ ١. گلولەی ریز ٢. تیلەی گلین

**گزمی** / gizmî/: ناو. ١. زبری؛ زروی ٢. توندوتیژی ☰ ١. زبری ٢. خشونت

**گـزن** / g(i)zin/: ئاوەلـناو. گـزنی: ١. فێڵـباز ٢. گزیکار ☰ ١. حقەباز ٢. شلتاق‌باز

**گزنگ** / gizing/: نـاو. گزینگ؛ گولـسوو؛ سـەرەتای تاوی بەیانی ‹پێش ئەوەی گزنگـی هـەتاو ترۆپکـی چیا بنگێوێ/ پێش ئەوەی شنەی بەیانی زولفی بەرەزا ببزێوێ «هێمن»› ☰ اوّلین تابش آفتاب

⊡ **گزنگ دان:** تازە دەرکـەوتنی تیشـکی خـۆر ☰ دمیدن آفتاب صبح

**گزنەک** / giznek/: ☜ **گەزەنەك**

**گزنی**[١] / giznî/: ناو. بوختان؛ درۆی درووسـکراو ☰ بُهتان

**گزنی**[٢]: ☜ **گزن**

**گزوفت** / giz û fit/: ناو. ١. تاسەی زۆر بۆ خواردنی شتێ ‹گزوفتمە بۆ گۆشتی برژاو!› ٢. سۆ؛ عەزرەت؛ داخ و کەسەر ‹بەشی ئێمە: هەر گز! هەر فت! هـەر گزوفت! «هەژار، *چوار نامیلکە*»› ☰ ١. اشـتیاق زیـاد برای خوردن چیزی ٢. حسرت

⊡ **گزوفتی کەسێ دان:** دیقەدیقەی کەسـێ دانـەوە؛ عەزرەت دان ‹دەیخوارد و گـزوفتی ئـەدایـن› ☰

حسرت به کسی دادن
**گزوفز** / giz û fiz/: ناو. پێچ و پا؛ ناڕاستی ☰ ناراستی
**گزوگوم** / giz û gum/: ☜ **گوزوگومبەت**
**گزوگومبەت** / giz û gumbet/: ☜ **گوزوگومبەت**
**گزوگومەت** / giz û gumet/: ☜ **گوزوگومبەت**
**گزۆری** / g(i)zorî/: ناوەڵناو. تەکووز؛ ڕێک‌وپێک؛ بێ‌کەم و کووڕی ☰ کامل؛ بی‌کم و کاست
**گزۆک** / g(i)zok/: ناوەڵناو. گزەون؛ گزەدەر؛ گزیکار ‹ڕووترش و گزۆک و گوێ‌نەبیستوو/ گرژ و مرومۆچ و کەس‌نەویستوو «هەژار، *مەم و زین*»› ☰ جرزن
**گزە** / g(i)ze/: ناو. ١. گز؛ فێڵ؛ حیلە ‹چلۆن بژیم لە شارەکەت/ کە پڕبەدڵ دژی گزەم؟! «سوارە»› ٢. *[منداڵانە]* گازی بە ددان لە زمانی زارۆکاندا ☰ ١. حیله؛ نیرنگ ٢. گاز با دندان
**گزەدەر** / g(i)zeder/: ☜ **گزۆك**
**گزەر** / g(i)zer/: ☜ **گێزەر-١**
**گزەرکی** / g(i)zerkî/: ☜ **گێزەر-١**
**گزەرگەسیاوێ** / g(i)zerges(i)yawê/: ناو. ڕەشەگزەر ☰ شقاقُل
**گزەگز** / g(i)zegiz/: ناو. ١. ڕەوتی کرووزانەوەی بە گریانەوە ٢. خەیاڵی کردنی کارێ ٣. تەز؛ تەزگ؛ تەزوو ☰ ١. گریه و ناله ٢. خیال انجام کاری ٣. گِز- گِز
**گزەون** / g(i)zewin/: ناوەڵناو. فێڵباز ☰ حیله‌گر
**گزی** / g(i)zî/: ناو. ١. فێڵ؛ گزی ٢. ☜ **گسك** ☰ ١. نیرنگ ٢. ☜ **گسك**
**گزیجاڕ** / g(i)zîcař/: ناو. گەزجاڕ؛ گزجاڕ؛ بێشەی دەوەنی گزگ ☰ گزستان
**گزیچار** / g(i)zîçar/: ☜ **گەز[1]-١**
**گزیر** / g(i)zîr/: ناو. ١. بەردەستی کوێخا لە دێدا ‹تاوێ دنیا بێ‌میرە، گزیر لە جێی وەزیرە/ ئەگەر نەما پشیلە، مشکان تلیلیلیلە! «هەژار، *شەرەفنامە*»› ٢. *[پلار]* نۆکەر ☰ ١. پادوی کدخدای ده ٢. نوکر
**گزیرانە** / g(i)zîrane/: ناو. پیتاکێ کە ڕەعیەت دەیدا بە گزیر ☰ باج پادوی کدخدا
**گزیرک** / g(i)zîrik/: ناو. ١. بریسکەی چاو لە دارکاری کردندا ٢. *[کینایە]* ئێشی زۆر ☰ ١. برق چشم هنگام چوبکاری شدن ٢. درد شدید
**گزیکار** / g(i)zîkar/: ناوەڵناو. گزیکەر؛ فێڵباز؛ حیلەساز ☰ ناروزن؛ نیرنگباز
**گزیکاری** / g(i)zîkarî/: ناو. قەڵ‌ودەڵ؛ فێڵبازی ☰ نیرنگبازی
**گزیکەر** / g(i)zîker/: ☜ **گزیکار**
**گزینگ** / g(i)zîng/: ناو. ١. ☜ **گزنگ** ٢. بیبیلە؛ ڕەشکێنەی چاو ☰ ١. ☜ **گزنگ** ٢. مردُمک چشم
**گزینون** / g(i)zînun/: ناو. زنون؛ توخمی کیمیایی بە ژمارە ئەتومی ٥٤ و کێشی ئەتومی ١٣١,٣٠ کە گازێکی دەگمەنە، تێکەڵی ئاو نابێ و بە ڕێژەیەکی زۆر کەم لە کەشدا هەیە ☰ گزنون
**گزینە** / g(i)zîne/: ناو. چەکوچ؛ چەکوش ☰ چکش
**گزێ** / g(i)zê/: ☜ **گسك**
**گژ[1]** / gij/: ناو. ١. قەدی دار ‹لاولاوێک لە گژ سپیدارەکە ئالاوە› ٢. گرژی؛ تووڕەیی ٣. دۆخی لوور بوون؛ بەرەخوار بوونەوە؛ لە ژوورەوە بە نهێم بەرەو خوار هاتن ☰ ١. تنەی درخت ٢. خشم ٣. حالت به پایین درغلتیدن
⊡ **بە گژ کەسێکدا هاتن/ هاتنەوە/ چوون**: چوونە گژ کەسێکدا؛ دە گژ کەسێ ڕاچوون؛ لە کەسێک تووڕە بوون ‹لەپڕ قسەی گۆڕا و بە گژمدا هات!› ☰ از کسی عصبانی شدن
**چوونە گژ کەسێکدا**: ☜ **بە گژ کەسێکدا هاتن/ چوون**
**دە گژ کەسێ ڕاچوون**: ☜ **بە گژ کەسێکدا هاتن/ چوون**

**گژ٢**: ئاوەڵناو. ١. شل و سست ٢. شـپرز و شـێواو؛ تێکهاڵاو ٣. ڕەق؛ سەخت ٤. ڕەپ‌وەستاو (موو) ٥. گ؛ گشت؛ هـەموو ‹گـژ گيـانم تێشـێ› ☰ ١. سُست ٢. ژولیده ٣. سخت؛ سفت ۴. سیخ شده (مو) ۵. همه

◘ **گژ کردن**: ١. کز کردن ٢. خۆ لێکهاڵانـدن ٣. ڕاست کردنەوە (موو) ☰ ١. کِز کردن ٢. چُمباتمه زدن ٣. راست کردن (مو)

**گژ٣**: دەنگ. وشەی دنەدانی جوانەگا بۆ سەر چـێڵ ☰ کلمه‌ی برانگیختن گاو گُشن

**گژ٤**: لێل. ← **گژوگیا**

**گژار / g(i)jar/**: ناو. گژاژ؛ گەژار؛ گەژاژ؛ جیکڵـدان؛ جیکلدانه؛ جیقڵدان؛ جێ دان و خـۆراکی باڵـنده ☰ ژاغر؛ چینه‌دان

**گژاژ / g(i)jaj/**: ☜ **گژار**

**گژان / g(i)jan/**: ☜ **هەڵگژان**

**گژاندن / g(i)jandin/**: چاوگ. ١. تێکەڵ ـ پێکـەڵ کردن ‹ماڵەکەی گژانـد و چـوو› ٢. *[کینایە]* ئـاژاوە نانەوە ☰ ١. درهم آمیختن ٢. آشوب به پا کردن

**گژژۆ / gijjo/**: دەنگ. وشەی دنە دانی جوانەگا بـۆ پەڕین لە مانگای بەکەڵ ☰ کلمه‌ی تشجیع گاو نـر برای جفتگیری با گاو ماده

**گژڤاموک / gijvamuk/**: ناو. پرچی هۆندراو ☰ موی بافته

**گـژک١ / gijik/**: نـاو. ١. کووژەکـــە؛ مۆرەکـــە ٢. تەرزەی ورد ☰ ١. خرمُهره ٢. تگرگ ریز

**گژک٢**: ئاوەڵناو. پەرژ و بلاو (قژ) ☰ پریشان (مو)

**گـژکن / gijkin/**: ئاوەڵـناو. ١. پـڕ و زۆر (مـوو) ٢. پڕلک و پۆپ ☰ ١. پُرپُشت (مو) ٢. پُرشاخ و برگ

**گژکە / gijke/**: ناو. پووکاولە؛ چەمۆلە؛ چەمبۆلە ☰ عمل ام کردن؛ پنجه گذاشتن

**گژگ / g(i)jig/**: ناو. دوگمە ☰ دکمه

**گژگژ١ / gijgij/**: نـاو. تێکەوە هاویشـتنی ئـاپۆرە ☰ شلوغی و ازدحام مردم

**گژگژ٢**: ئاوەڵناو. وشک؛ زوا؛ زوها ☰ خُشک

**گژگژ٣**: دەنگ. گژ؛ کەڵە؛ کەڵە ـ کەڵە؛ وشەی دنـە دانی جوانەگا بۆ سەر چێڵـی بەکـەڵ ☰ کلمـه‌ی برانگیختن گاو گُشن

**گژگژاندن / gijg(i)jandin/**: چاوگ. ١. هانەدان بۆ شەڕ ٢. بەرپڵ کردن؛ ماڵ کردنەوە ☰ ١. تحریک کردن برای شروع جنگ ٢. ساختمان ساختن

**گژگژە / gijg(i)je/**: ناو. پووش و پەڵاشی بابردەڵـە ☰ گیاه خشک بادآورده

**گژگـــژەک / gijg(i)jek/**: نـــاو. بەفرخۆرکـــــە؛ بەفرەخوەرە؛ جـۆرێ تـەرزەی زۆر ورد ☰ نـوعی برف بسیار ریز

**گژگژین / gijg(i)jîn/**: چاوگ. ١. ڕاست بوونـەوەی موو لە ترسان ٢. بەرپا بوون؛ ڕاست و بڵند بوونی بینا ☰ ١. سیخ شدن مـوی بـدن از شـدت تـرس ٢. برافراشتن ساختمان

**گژل / g(i)jil/**: ناو. تەرزە؛ تەزرە؛ تەیرۆک ☰ تگرگ

**گژلـوک / gijluk/**: نـاو. تەزرۆکـە؛ تـەزرەی ورد ☰ تگرگ ریز

**گژم١ / gijm/**: ناو. ١. خەم؛ خەفەت ٢. بەرهـەنگ؛ نەخۆشی تەنگەنەفەسی ☰ ١. اندوه ٢. نفس‌تنگی

**گژم٢**: ئاوەڵـناو. گـرژ؛ درژ؛ مـۆن؛ مـۆڕ؛ ڕووتـرش؛ مڕومۆچ؛ ناوچاوتاڵ ☰ اخمو

**گژمراندن / gijm(i)randin/**: چاوگ. هـاڕین؛ ورد کردن ☰ آسیاب کردن

**گژمرین / gijm(i)rîn/**: چاوگ. هاڕان؛ هاڕیان؛ ورد کران ☰ آسیاب شدن

**گژن / g(i)jin/**: ئاوەڵـناو. تێکهـاڵاو (مـوو و ...) ☰ ژولیده

**گژنای / gijnay/**: چاوگ. گژ کردن ☰ ژولیدن

**گژنژە / gijn(i)je/**: ☜ **گژنیژ**

**گژنەسەرە / gijnesere/**: ئاوەڵـناو. ســەرقژن ☰

ژولیدەموی

**گژنیز** / gijnîz/: ☜ **گژنیژ**

**گژنیـژ** / gijnîj/: نـاو. گژنیـژە؛ گژنێـژ؛ کشـنیز؛ گشـنیز؛ گژنـژە؛ گژنیـز؛ تاولـە؛ تاولـە؛ تاولـێ؛ بـەنارۆمی؛ سـەبزییەکی خۆراکییـە، بـە گولـی چەتراسای پەمەیی یان سپییەوە، دژی سەرئێشە و کۆلنج و گرسانی خوێنە ☰ گشنیز

**گژنیژە** / gijnîje/: نـاو. ١. گژلوک؛ تەرزەی ورد ٢. زبری پێست لـە سـەرمان ٣. کشـنیژە؛ جـۆرێ زەنبەر ٤. ☜ **گژنیژ** ٥. گـۆی مـەمکی ژنـان ٦. جۆرێ چێشتی تەڕە، گژنیژی تـێ دەکـەن ☰ ١. تگرگ ریز ٢. حالت خشن شـدن پوست از سرما ٣. نوعی زیور ٤. ☜ **گژنیژ** ٥. نوک پستان زن ۶. آش گشنیز

**گژنێژ** / gijnêj/: ☜ **گژنیژ**

**گژوگیـا** / gij û g(i)ya/: نـاو. پـووش‌وپـار؛ پووش‌وپلاش؛ ڕوەک ☰ نباتات علفی

**گژولی** / g(i)julî/: ☜ **گژۆرەك**

**گژویی** / g(i)juyî/: ناو. خیزەرە؛ ئـالاش؛ هـەلاش؛ هەراش ☰ انبیره

**گژۆرەک** / g(i)jorek/: ناو. گژولی؛ وردە چرپـی بـۆ ئالاشی بان داپۆشین ☰ انبیره

**گژۆژ** / g(i)joj/: ناوەڵـناو. چلکن و قژن ☰ چرکین و ژولیده مو

**گژۆل** / g(i)jol/: نـاو. جـۆرێ داری جەنگـەڵ ☰ از درختان جنگلی

**گژۆلـە** / g(i)jole/: ناوەڵناو. پەرژ و بلاو ☰ پراکنده و آشفته

**گژۆلەک** / g(i)jolek/: ☜ **گیژەڵۆکە**

**گژۆ ـ مژۆ** / g(i)jo m(i)jo/: ناوەڵـناو. تێکـەڵ ـ پێکەڵ؛ ناتەکووز ☰ درهم‌وبرهم و بی‌نظم

**گژە**[1] / g(i)je/: ناو. گیایەکە بۆ دەرمـان دەشـێ ☰ گیاهی دارویی

**گـژە**[2]: دەنگـەناو. دەنگـی بـای بەتـەوژم ‹دیـق و زەردوویی و ئاهۆ و وەرهەم/ بە گژەی بـای بەقـەوەت دێن بەرهەم «سوارە»› ☰ گِژـگِژ؛ صدای تندباد

**گژە**[3]: دەنگ. دنەی جوانەگا بـۆ سـەر مانگـای بـە کەڵ ☰ کلمه‌ی تحریک گشن بر ماده گاو

**گژەبا** / g(i)jeba/: ناو. بای توندی پایزی ☰ باد تند پاییزی

**گژەگژ** / g(i)jegij/: دەنگەناو. گژەی زۆر ☰ گِژـگِژ؛ صدای مُمتد تندباد

**گژی** / g(i)jî/: ناو. خەرموورگ؛ گژک؛ کوژەکـە ☰ خرمُهره

**گژیـان** / gijyan/: چاوگ. قرژ بوون و شێوانی مـوو ☰ آشفتن و ژولیدن مو

**گژیـای** / gijyay/: چـاوگ. بـە گـژدا چـوون ☰ درآمیختن؛ جنگیدن

**گس** / gis/: دەنگ. کس؛ وشەی لێخوڕینی پـەز ☰ کلمه‌ی راندن گوسفند

**گست** / gist/: نـاو. گوسـت؛ تیـل؛ تلـی؛ قامـک؛ ئەنگوست؛ ئەنگووس ☰ انگشت

**گسک** / gisk/: ناو. گزک؛ گزگ؛ گزی؛ گزێ؛ گـەز؛ گەزک؛ گەسک؛ گێزک؛ گێزی؛ گێسک؛ جـاڕوو؛ گێـزگ؛ کێـزی؛ کنۆشـە؛ کونۆشـە؛ هاڤـلیک؛ هێڤالەک؛ شفیک؛ سفیک؛ گیاریفک؛ جـەڕیفک؛ مفەیتەن؛ کتکە؛ کەرەسەیەک کە خاک و خۆڵ و شەخەلی پێ ڕادەماڵن. هەروەها: **گسکی دەستی؛ گسکی بەرقی/ کارەبایی** ☰ جارو

▣ **گسکە کوتەرە**: *[پلار]* ژنی پیر و پـەککەوتـە ☰ زن پیر و فرتوت

▣ **گسک دان**: گـزک/ گـزگ دان؛ گـەز کـەردش؛ گەسک دان؛ گەسک لێدان؛ گێزک کـردن: ١. ماشـتن؛ ماشـتنەوە ٢. *[کینایە]* بـردنی هـەموو شتێ لە مالدا ٣. *[کینایە]* هەڵگرتنی خەرمان ☰ ١. جـارو کـردن ٢. غـارت کـردن ٣. کـاه و علـف

کوبیده شده را به خانه بُردن

**گسکدەر / giskder/**: ناو. گزکـدەر؛ گزگـدەر؛ گەسکدەر؛ کەسێ کە بە گسک کار دەکا ☰ جاروزن

**گسکە / giske/**: ناو. کسکە؛ بریقەی چاوی پشیلە لە تاریکیدا ☰ برق چشم گربه در تاریکی

**گسکەبەداری / giskebedarî/**: ناو. یارییەکی منداڵانەیە، سواری گەسک دەبن ☰ از بازی‌های کودکانه

**گسکەچۆمی / giskeçomî/**: ناو. جۆرێ گیای باڵابەرزە لە قەراخ چۆم دەڕوێ، لاسکەکەی مەیلەو سوورە و دەیکەنە گەسک ☰ گیاهی است

**گسکەسواخ / giskes(i)wax/**: ناو. کار و ڕەوتی سواخ دانی دار و دیوار بە گەسک و قوڕەشلەی سپی ☰ گل‌اندود دیوار با جارو

**گسکەشینە / giskeşîne/**: ناو. گیایەکە لە بەراوان شین دەبێ و دەیکەنە گەسک ☰ گیاهی است

**گسکەفەقێ / giskefeqê/**: ناو. گیایەکە گوڵی زەرد و سوور دەکا، وەک گڕاڵک وایە بەڵام نیو میتر بەرزە و لقەڵق شین دەبێ، وەک گەسک کەڵکی لێ وەردەگرن ☰ گیاهی است

**گسکەکۆڵە / giskekołe/**: ناو. گزیەکۆتەرە؛ گسکی زۆر کارکردوو و قوڵە ☰ جاروی کارکرده و فرسایش رفته

**گش / giş/**: ناوەلناو/ ناوەلکار. گ؛ گژ؛ گشت؛ تێکڕا؛ هەموو ☰ همه

**گشپرسی / gişpirsî/**: ناو. گشتپرسی؛ کۆپرسان؛ کۆمەڵپرسی؛ ڕیفراندۆم؛ لێپرسینەوەی گشتی، بۆ سەلماندن یان لابردنی قانوونێک ☰ همه‌پرسی

**گشت[1] / gişt/**: ناو. قامک؛ ئەنگوس ☰ انگشت

▣ **گشتا نۆرتی**: گشتامیانین؛ زەڕنەقووتە؛ قامکی ناوەڕاست ☰ انگشت وسطی

**گشتا پلل**: تبلامەزن؛ قامکە گەورە ☰ انگشت شست

**گشتا قلانج**: قامکەتووتە ☰ انگشت کوچکه

**گشتا میانین**: ☜ **گشتانۆرتی**

**گشت[2]**: ناوەلناو. ١. بادراو؛ باوخواردوو ٢. گش؛ هەموو ‹گشت ساڵێ› ☰ ١. تابیده ٢. همه

**گشت[3]**: ناوەلکار. تێکڕا؛ لە سەر یەک؛ پێکەوە ‹گشت بە جارێ هاواریان کرد: نامانەوێ!› ☰ همگی؛ همه

**گشت[4]**: جێناو. هەموو ‹ئەم بەشە زەوییە هێن گشتمانە؛ گشتیانی هەڵگرت› ☰ همه

**گشت ـ**: پێشوشە. هەموو؛ گش؛ گەل ‹گشتکارە؛ گشتپرسی› ☰ همه ـ

**گشتانە / giştane/**: ناو. ١. گشتر؛ گوستیل؛ گوستیلک؛ گوستیلە؛ ئەنگوستیلە؛ کلکەوانە ٢. گشتۆنە؛ گیشتۆنە؛ گوزڤان؛ گوستیل؛ گوستیلە؛ گوشپان؛ قووچەکەی دورمان ٣. قولی درەو؛ ئەوندەی لە دەستێکا جێ ببێتەوە ☰ ١. انگشتر ٢. انگشتانەی خیاطی ٣. میزانی معادل یک کف دست

**گشتپرسی / giştpirsî/**: ☜ **گشپرسی**

**گشتر / giştir/**: ☜ **گشتانە-١**

**گشتک / giştik/**: ناو. گونک؛ ئەنگوتک ☰ چونه

**گشتلایی / giştlayî/**: ناوەلناو. هەموانی؛ گشتی ☰ همگانی

**گشتۆنە / giştone/**: ☜ **گشتانە-٢**

**گشتە / gişte/**: ناو. بادە؛ کرژە ☰ بافته؛ ریسیده

**گشتەک / giştek/**: ناو. ١. بەنی بادراو؛ پێچەوانەی خاو ‹... گشتەک و خاو، کاڵ و کوڵاو، هەمووی هەر بەشی ئەوانە و تۆش لە دوورەوە بڕوانە! ... «هەژار، *چوار ناميلکه*»› ٢. بەنی بادراوی دوعا لێخوێندراو ‹فێر نەبووی سیحر و گشتەک و نوشتوو/ نە جگە گورگت هەیە، نە مووروو «هێمن»› ☰ ١. نخ تابیده ٢. نخ طلسم شده

**گشتی / giştî/**: ناوەلناو. تێکڕایی؛ هەموانی

‹داواکاری گشتی؛ خەزینەی گشتی› ☰ عمومی؛ همگانی

**گشک / gişk/**: ناو. ١. ☜ **گشکه** ٢. پەنجەی ئاوالەکراو ٣. گژک؛ تەرزەی ورد ☰ ١. ☜ **گشکه** ٢. پنجەی باز ٣. تگرگ ریز

**گشکه / gişke/**: ناو. گشک؛ گفشک؛ پووکاولە؛ چەمبۆلە؛ چەمۆلە ☰ ام

**گشکی[1] / gişkî/**: ئاوەلکار. تێکڕا؛ سەرلەبەر؛ هەموو؛ سەرجەم ‹ئەو گەنمەشامییە گشکی بە چەن؟› ☰ همگی؛ جملگی

**گشکی[2]**: جێناو. هەموو ‹گشکی چوو؛ گشکیمان برد› ☰ همه

**گشگیر / gişgîr/**: ئاوەلناو. هەموانی؛ گشتی ☰ همگانی

**گش‌لەگش / gişlegiş/**: ☜ **گش‌لەگشت**

**گش‌لەگشت / gişlegişt/**: ئاوەلکار. گش‌لەگش؛ ساف‌لەساف؛ بەتەواوی ☰ تمام و کمال

**گشنیز / gişnîz/**: ☜ **گژنیژ**

**گغ / g(i)ğ/**: ☜ **گغه[1]**

**گغکی / giğkî/**: ناو. کۆرپە؛ منالی گغ‌وێژ ☰ نوزاد

**گغنی / giğnî/**: ناو. شلتاغ؛ تەشقەلە؛ تەلەکە ☰ شلتاق

**گغه[1] / g(i)ğe/**: دەنگەناو. *[مندالانە]* گغ؛ گغەوبڤ؛ گغەوبڤه ‹زارۆکەمان گغه و بڤه دەکا› ☰ غان‌وغون

**گغه[2]**: دەنگ. *[مندالانە]* بڤه؛ بە مانای وریا بە ‹گغه! نەکەی!› ☰ کلمەی تحذیر کودکان

**گغەوبڤ / g(i)ğe w biv/**: ☜ **گغه[1]**

**گغەوبڤه / g(i)ğe w b(i)ve/**: ☜ **گغه[2]**

**گف / gif/**: ☜ **گەف[1]-١**

⊡ **گف کردن**: خۆ هەلمەساندن لە تووڕەیی ‹لە داخانا خۆی گف کردبوو› ☰ باد کردن از عصبانیت

**گفت / gift/**: ناو. گفته : ١. پەیمان؛ بەڵێن ‹گفتی دامێ، درۆی کرد› ٢. قسە ‹گفتی زۆر خۆشە› ☰ ١. قول؛ پیمان ٢. بیان؛ سخن

⊡ **گفت دان**: ١. بەڵێن دان ٢. پەیمان بەستن ☰ ١. قول دادن ٢. عهد بستن

**گفتار / giftar/**: ناو. وتاربێژی؛ قسە بۆ خەڵک ☰ سُخنرانی؛ گفتار

**گفت‌خۆش / giftxoş/**: ئاوەلناو. زارخۆش؛ دەم‌وراوێژخۆش ☰ شیرین‌زبان

**گفتنامه / giftname/**: ناو. قەرارنامە؛ بڕیارنامە؛ بەڵێن‌نامە ☰ قولنامه

**گفت‌وگۆ / gift û go/**: ناو. وت‌وویژ؛ وتوێژ؛ دەڤچەنگ؛ دەمەتەقێ؛ دەمەتەقە؛ مچلگە؛ گەپ و گوڕ؛ کاری یەک دواندن ☰ گفتگو

**گفت‌ولفت / gift û lift/**: ناو. سەر و زوان؛ قسە و گفت‌وگۆ ‹گفت‌ولفتی یەکجار خۆشە› ☰ سروزبان

**گفت‌ولفت‌خۆش / gift û liftxoş/**: ئاوەلناو. ڕووخۆش؛ سەروزمان خۆش ☰ خوش‌مشرب

**گفته / gifte/**: ☜ **گفت**

**گفشک / gifşik/**: ناو. ١. قورینج؛ نوقرچک ٢. ☜ **گشکه** ☰ ١. نیشگون ٢. ☜ **گشکه**

**گڤ[1] / giv/**: ناو. ١. گشتەک؛ بەنی بادراو ٢. گڤ؛ کاری ترساندن بە قسە ☰ ١. نخ تابیده ٢. تهدید

**گڤ[2]**: ئاوەلناو. گیڤ؛ پف‌کردوو ☰ بادکرده

⊡ **گڤ کردن**: ١. گردەوە بوون و پف کردن ٢. خۆ پف دانی بالندە ☰ ١. باد کردن و جمع شدن ٢. پُف کردن پرنده

**گڤ[3]**: دەنگ. گیڤه؛ دەنگی بەردی هاوێژراو بە قۆچەقانی ☰ صدای سنگ پرتاب شده با فلاخن

**گڤاشتن / g(i)vaştin/**: ☜ **گوشین**

**گڤاشگه / g(i)vaşge/**: ☜ **گوشینگه**

**گڤاله / g(i)vale/**: ناو. کۆمەڵی چەکدار ☰ گروه تفنگدار

**گڤاند[1] / g(i)vand/**: ناو. هێل؛ خەتی جووت ☰ شیار شخم زمین

**گڤاند**[٢]: ناوەڵناو. خوار و خێچ 🇮🇷 کج و کوله

**گڤانده / g(i)vande/**: ناو. ١. سەرلێوی کەنداڵ و شاخ ٢. هەوگە؛ کەوشەنی زەمینی کێڵگە 🇮🇷 ١. لبەی پرتگاه ٢. مرز کشتگاه

**گڤر / givir/**: ☜ **گیڤر**

**گڤرت / givirt/**: ناو. کێم و چلکی برین 🇮🇷 چرک و ریم زخم

**گڤردی / givirdî/**: ناو. گڤۆردی؛ ڕەوتی لەرزین لە ترسان؛ ڕاچەنین 🇮🇷 لرزه از ترس

**گڤرک / givrik/**: ناو. هەراش؛ ساوای بەکەیف و تەیار 🇮🇷 نوزاد شاداب

**گڤزۆنەک / givzonek/**: ناو. گیایەکی دەشتەکییە 🇮🇷 از گیاهان صحرایی

**گڤشک / givşik/**: ناو. ١. گونک؛ ئەنگوتکەهەویر ٢. قورینج؛ نوقرچک 🇮🇷 ١. چونەی خمیر ٢. نیشگون

**گڤڤە / givve/**: دەنگەناو. گڤە؛ گوف؛ گیڤە: ١. گف؛ دەنگی بەردی بەرەقانی ٢. دەنگی سووڕانی خولخوله و مزراق 🇮🇷 ١. صدای سنگ پرتاب شده از فلاخن ٢. صدای چرخش شدید گردنا

**گڤکڤ / givkiv/**: دەنگەناو. گژەگژ 🇮🇷 صدای تُند باد

**گڤگڤە / givg(i)ve/**: ناو. دارێکی جەغزییە دوو کونی تێ کراوە بەنی تێ دەخەن و بای دەدەن گڤەگڤی لێ دێت 🇮🇷 نوعی فرفرەی چوبی

**گڤن / g(i)vin/**: ناوەڵناو. مووگرژ؛ مووتێکهاڵاو 🇮🇷 ژولیدەمو

**گڤویشک / givwîşk/**: ☜ **گۆیژ**

**گڤۆردی / g(i)vordî/**: ☜ **گڤردی**

**گڤە / g(i)ve/**: دەنگەناو. ١. ☜ **گڤڤە** ٢. گژە؛ دەنگی بای بەقەوەت 🇮🇷 ١. ☜ **گڤڤە** ٢. گِژ-گِژ؛ صدای بادِ شدید

**گڤەگڤ / g(i)vegiv/**: دەنگەناو. دەنگی گڤەی لە سەر یەک ‹هەر گڤەگڤی دێ!› 🇮🇷 گِژ-گِژ؛ صدای مُمتد باد

**گڤی / g(i)vî/**: ناو. دەڵەمەی پەنیر 🇮🇷 دلمەی پنیر

**گڤیر / g(i)vîr/**: ☜ **گۆیژ**

**گڤیراندن / g(i)vîrandin/**: چاوگ. مهاندن؛ هەرس کردن؛ هەڵتاواندن 🇮🇷 هضم کردن

**گڤیژ / g(i)vîj/**: ☜ **گۆیژ**

**گڤیش / g(i)vîş/**: ☜ **گۆیژ**

**گڤیشک / g(i)vîşk/**: ناو. ١. ☜ **گۆیژ** ٢. کوشراو؛ کوشراوی میوە 🇮🇷 ١. ☜ **گۆیژ** ٢. عُصاره

**گڤین / g(i)vîn/**: چاوگ. مەیین؛ بوونە ماست یان پەنیر 🇮🇷 بند آمدن شیر

**گڤێری / g(i)vêrî/**: ناو. ژان و برک 🇮🇷 دلپیچه

**گڤێرین / g(i)vêrîn/**: چاوگ. هەڵتاواندن؛ هەرس کردن 🇮🇷 گواردن؛ هضم کردن خوراک

**گل / gil/**: ناو. ١. ژان؛ ئێش ‹سەرم گل ئەکا› ٢. ژان و نەخۆشیی چاو ‹چاوی هاتە گل› ٣. جووڵە؛ بزاو؛ تەکان ‹لە جێیەی خۆوت دانیشە! گل نەخۆوی!› ٤. تل؛ خلۆر ‹گل بۆوە و تا خوار چوو!› ٥. خاکێ کە ژنان سەریانی پێ دەشۆن ‹عوناب و خاکشیر، جەوهەر میوە/ هەر لە گل سەرشوور تا گل گیوە «شامی»› ٦. جار؛ کەڕەت ٧. کار و ڕەوتی ڕاگرتن ‹گلم داوەتەوە› ٨. ترۆپکی چیا؛ دوندی کێو ٩. سەرلق؛ لکی هەرە بڵندی دار ١٠. زیپکە؛ جۆش ١١. دەرفەت؛ فرسەت ‹گل ئەڕام نەکەفت› 🇮🇷 ١. درد ٢. بیماری و درد چشم ٣. حرکت ٤. غلت ٥. گل سرشوی ٦ بار؛ دفعە ٧. عمل نزد خود نگهداشتن ٨ قلەی کوە ٩. بلندترین شاخەی درخت ١٠. جوش پوست ١١. فُرصت

⊡ **گل بوونەوە** گلار بوونەوە؛ خلۆر بوونەوە 🇮🇷 غلتیدن؛ غلت خوردن

**گل خواردن** ١. خلۆر بوونەوە ٢. جووڵان ٣. بە دەورەدا گەڕان ٤. مانەوە لە شوێنێک 🇮🇷 ١. غلتیدن؛ غلت خوردن ٢. جُنبیدن ٣. پیرامون (چیزی) گشتن ٤. واماندن در جایی

**گـوریس گرتنـەوە** چـنین و دروسـت کـردنی گوریس ☰ طناب بافتن

**گـوریس‌پێچ / gurîspêç/**: نـاو. باپێچـەک؛ کـاری شەتەک دان؛ توند بەستن ☰ کارِ مُحکم بستن

**گوریس‌کێشکێ / gurîskêşkê/**: ☜ **گوریس‌کێشەکی**

**گوریس‌کێشەکی / gurîskêşekî/**: ناو. گوریس‌کێشی؛ گوریس‌کێشکێ؛ کێبەرکێ لە گـوریس ڕاکێشـاندا ☰ مسابقەی طناب‌کشی

**گوریس‌کێشی / gurîskêşî/**: ☜ **گوریس‌کێشەکی**

**گوریشتە / gurîşte/**: ☜ **گورشتە**

**گوریک / gurîk/**: ناو. دەزووی؛ دەزگ ☰ نخ

**گـوری ـ گـوری / gurî gurî/**: نـاو. حەمـەگورگێ؛ یارییەکی منداڵانە، یەک دەبێتە گورگ و ئـەوانی تر دەگرێ ☰ گُرگم به هوا

**گورین / gurîn/**: چاوگ. ١. سـەر بـڕین؛ سـەرژێ کرن ٢. دارنـران لـە پێسـت ☰ ١. سر بُریـدن ٢. پوست‌کنده شدن

**گورینگ / gurîng/**: ☜ **گوڵەنگ**

**گوریەشەوێ / guryeşewê/**: ☜ **گورگەشەوێ**

**گورێخ / gurêx/**: ناوەڵناو. ١. لـەخۆبایی؛ لووتبـەرز؛ بەفیز ٢. دڕ و شەڕانی ‹سەیێ گـورێخ د تووڵـەتێی دە ژی گورێخە› ☰ ١. ازخودراضی؛ پُرافاده ٢. جسـور و ماجراجو

**گورێختە / gurêxte/**: ناو. چەورایی و بەزی ناو زگ ئاژەڵ ☰ چربی و پیه درون شکم دام

**گورێز / gurêz/**: نـاو. دوورەپـەرێزی؛ کـەنارەگیری ☰ گوشەگیری

⊡ **گورێز دان**: خۆ پارازتن لە کارێ ☰ دوری جُستن از کاری

**گـورێزانن / gurêzanin/**: چاوگ. ئاوارە کردن؛ تەرە کردن ☰ متواری کردن

**گورێس / gurês/**: ☜ **گوریس**

**گورێس‌کێشکێ / gurêskêşkê/**: نـاو. خووگەملـە ☰ مسابقەی طناب‌کشی

**گورێ ـ گورێ / gurê gurê/**: دەنگ. دەنگـی بانـگ کردنی پەز بۆ جیا بوونەوە لە ڕان و هاتنەوە بەرەو ماڵ ☰ کلمەی خواندن گوسفند

**گـورێن / gurên/**: نـاو. ١. سـەربڕی حـەیوان ٢. کەوڵکەری حەیوان ☰ ١. سلّاخ ٢. پوستکن

**گوڕ[1] / guř/**: ناو. ١. توان و تاقەت ‹هێشتا مابوو گوڕ و هێزم/ هێشتا گەرم بوو ئامێزم «هێمن»› ٢. گوژم؛ قەوەت؛ زەبر ‹بوومەلەرزەیەک بە گوڕی ٧,٣ ڕیشتەر لە سـەرپێل ڕووی دا› ٣. لـەز؛ هەشـتاو؛ خێرایـی؛ توندی؛ گورجی ٤. هەڕەشـە و گوڕەشـە؛ کـاری ترساندن بە قسـە ٥. خـوڕە و گرمـە ٦. بلێسـە؛ گڕی ئاگر ٧. داوەبەنێ کە دەخرێتە پای مەل ‹بە کینەیـەکی سـەختەوە/ گـوڕی تۆڵـەیان بەسـتەوە «شـێرکۆ»› ٨. کـاری بـە خـڕی ڕۆیشـتن ☰ ١. انرژی؛ نیرو ٢. شدت؛ قـوّت ٣. شـتاب ۴. تهدیـد ۵. غُرّش ۶. زبانەی آتش ٧. ریسمانی که به پـای پرنـده می‌بندند ٨. عمل همه با هم رفتن

⊡ **گوڕ بەستن**: بە لەز ڕاکردن ☰ با شتاب دویدن

**گوڕ بەستنەوە** ☜ **گوڕ گرتنەوە**

**گوڕ گرتنەوە** گوڕ بەستنەوە؛ بووژانەوە ☰ دوبـاره جان گرفتن

**گوڕ[2]**: ناوەڵناو. خوڕ؛ وەگەڕ ☰ جاری؛ روان

**گوڕان / guřan/**: ☜ **گوڕاندن**

**گوڕانـدن / guřandin/**: چـاوگ. تێپـەڕ //گوڕانـدت؛ دەگوڕێنی؛ بگوڕێنە// گوڕان؛ گـوڕڕان؛ بـە دەنگـی قـەو قیرانـدن ‹مەگوڕێنـە! سـەبر قسـە بکـە!› ☰ غُریدن؛ نعره زدن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەگوڕاندن

**گوڕاو / guřaw/**: ناو. تانەی سەر گلێنـەی چـاو ☰ لکەی روی مردمک چشم

**گوڕایگـوڕ / guřayguř/**: ناوەڵکار. لـە پەسـتا و بـە لێشـاو؛ تـون ـــ تـون ‹گوڕایگـوڕ دەسـتی بـەرز

دەکردەوە› ☰ پیاپی

**گوڕچنگ** / guřçing/: ناو. عاسا؛ گۆچان ☰ عصا

**گوڕڕان** / guřřan/: ☜ گوڕاندن

**گوڕڕاندن** / guřřandin/: چاوگ. قیواندن؛ قریوە کردن ☰ غریویدن

**گوڕڕە**[1] / guřře/: ناو. پێشبڕکێ؛ ملە ☰ رقابت

**گوڕڕە**[2]: دەنگەناو. گوڕە؛ هەرا ـ هەرا ☰ سروصدا

**گوڕژ** / guřj/: دەنگەناو. گرمەی هەور ☰ رعد؛ غُرّش ابر

**گوڕژاندن** / guřjandin/: چاوگ. گرماندنی هەور ☰ غُرّیدن ابر

**گوڕگوڕ**[1] / guřguř/: ناو. ١. زوڕزوڕ؛ گریانی بە دەنگی بەرز ٢. هەراو زیقەزیق ☰ ١. شیون و زاری ٢. جیغ و داد

**گوڕ.گوڕ**[2]: ناوەلکار. خوڕ-خوڕ ‹گوڕ- گوڕ فرمێسکی دەهاتە خوارێ› ☰ شُر-شُر

**گوڕگوڕی** / guřguřî/: ناوەلناو. ١. بە زیقە و هەرا ٢. زۆر بە گرمەگرم ☰ ١. جیغ‌جیغو ٢. غُرّان

**گوڕم** / guřm/: ناو. ١. زەرپ؛ زەربەت؛ وێکەوتنی کوت‌وپڕ و بەتەوژمی شتێ لە شتێکی تر ٢. کاری بە توندی سەر لە گوانی دایک کوتانی بەرخ، کاتی شیر خواردنی ‹گوڕمێکی لە گوانی دایکی دا› ☰ ١. ضربە ٢. کلە زدن برە بە پستان مادرش هنگام شیر خوردن

**گوڕمچ** / guřmiç/: ☜ گوڕمچە

**گوڕمچە** / guřimçe/: ناو. گرمست؛ گورمیچە؛ گورمێچە؛ گورمچ؛ گوڕمچ؛ گوڕمۆچ؛ گۆڕمچە؛ مست؛ مشت ☰ مُشت

**گوڕمشت** / guřmişt/: ناو. گوڕمیچ؛ گورمشت؛ مستەکۆلە؛ مشتی قووچاو ☰ مُشت گرە شدە

**گوڕمۆچ** / guřmoç/: ☜ گوڕمچە

**گوڕمۆڕە** / guřmoře/: ناو. جەنجاڵ و تێکئالاوی ئاپۆرە ☰ شلوغی و ازدحام

**گوڕمەتە** / guřmete/: ناو. شاتاوڵی بە توندی ☰ حملەی با شیرجە

**گوڕمیچ** / guřmîç/: ☜ گوڕمشت

**گوڕنوک** / guřnûk/: ناو. دەوەنێکی دڕکاوییە ☰ درختچەای خاردار

**گوڕنەتەڵە** / guřnetełe/: ناو. ١. *[یاوەری گۆن]* بوونەوەرێکی خەیاڵی ٢. ناوێکی بێ ناوەرۆک ☰ ١. موجودی خیالی ٢. اسم بی‌مُسمّا

**گوڕنی**[1] / guřnî/: ناو. ١. دەوەنێکە ٢. شینکە؛ گیای تازەڕواو ٣. جێگەی گوڵ پەروەردە کردن ☰ ١. درختچەای است ٢. گیاه تازە سردرآوردە ٣. گُلخانە

**گوڕنی**[2]: ناوەلناو. *[پلار]* ١. قوتەکەی پووتەکەی خڕیلە ٢. لەخۆبایی؛ بەفیز ‹وا گوڕنی بووە قسە لەگەڵ کەس ناکا› ☰ ١. ریزەمیزە ٢. مغرور

**گوڕنیک** / guřnîk/: ناو. بەن‌سامۆرتە ☰ فتراک

**گوڕۆز** / guřoz/: ناوەلناو. *[پلار]* گرووگر و گرینۆک ☰ بهانەگیر و خوش‌گریە

**گوڕۆزی** / guřozî/: ناو. پەلپ و گروو ☰ گریە و بهانەگیری

**گوڕوو**[1] / guřû/: ناو. پەلپ و گرووی زارۆک ☰ بهانەی بچە

**گوڕوو**[2]: ☜ گرووێ[2]

**گوڕە**[1] / guře/: ناو. ١. کاری ترساندن بە قسە ‹ئەوەی ئیمڕۆ لە مەیدانا گوڕەی دێ/ بە بەرزی تێ‌مەگە چاکی کەوایە «عارف عورفی»› ٢. جەنگە؛ گەرمە ‹گوڕەی بەرهاییە ئێستێکە شاخ و داخی ولات/ پڕە لە لالە و نەسرین و نەرگسی شەهلا «حاجی قادر»› ☰ ١. نهیب؛ تهدید لفظی ٢. هنگام؛ عُنفوان

**گوڕە**[2]: دەنگەناو. ١. دەنگی زۆر زل و بەقەو ‹داخۆ دەروونی سافە، گوڕەی ماوە تانجەڕۆ/ یا خۆ ئەسیری خاکە بە لێلی دەکا عوبوور؟ «نالی»› ٢. دەنگی

هەور ٣. ☜ گوڕڕە[٢] ⚏ ١. غُرُنبه ٢. صدای رعد ٣. ☜ گوڕڕە[٢]

**گوڕەد** / guřed/: ناو. کەوەرگ؛ کەوەر؛ لە سەوزیجاتە ⚏ تره

**گوڕەشە** / guřeşe/: پێرۆ. ← هەڕەشەوگوڕەشە

**گوڕەکەو** / guřekew/: ناو. کێبەرکێی خوێندنی کەو ⚏ مسابقەی کبک‌خوانی

**گوڕەگوڕ** / guřeguř/: دەنگەناو. ١. زەنا ـ زەنا ٢. گرمە و هەرای هەور ⚏ ١. سروصدای زیاد ٢. غُرّش ابر

**گوڕەو** / guřew/: ناو. کەوەر ⚏ تره

**گوڕی**[١] / guřî/: ناو. ١. بڵێسە؛ گڕی ئاگر ٢. خوڕی؛ تەوژمی ڕەوتانەیەک (وەک: ئاوی چۆم و ڕووبار و ...) ٣. مەزرایەک کە سەرما هەڵیتەکاندووە ⚏ ١. زبانەی آتش ٢. شدت جریان (آب رودخانە و ...) ٣. کشتزاری کە سرما بدان آسیب رسانده است

**گوڕی**[٢]: ئاوەڵناو. ١. ☜ گرویێ[٢] ٢. زۆر کەچەڵ ⚏ ١. ☜ گرویێ[٢] ٢. کاملاً کچل

⊡ **گوڕی بوون**: گرویێ بوون؛ نەخۆشی گرویی گرتن ⚏ گر شدن

**گوڕیل** / guřîl/: ☜ گلۆان

**گوڕین** / guřîn/: چاوگ. شیڕان؛ نەڕە کردن ⚏ غریدن

**گوز** / guz/: ☜ گوزوگومبەت

**گوزار**[١] / guzar/: ناو. گوزەر؛ کار و ڕەوتی تێپەڕین ‹کاتێ گوزارت کەفتە ئەم شارە، هەواڵێکی ئێمەش بپرسە!› ⚏ گُزار

**. گوزار**[٢]: پاشەوشە. پێک‌هێن ‹کارگوزار› ⚏ ـ گزار

**گوزارش** / guzariş/: ناو. هەواڵ؛ خەبەر؛ گوزارشت ⚏ گُزارش

**گوزارشت** / guzarişt/: ☜ گوزارش

**گوزارە** / guzare/: ناو. واتا؛ مانا ⚏ معنی

**گوزان** / guzan/: ناو. کافرمان؛ گوێزان؛ چەقۆی تیژی مووتاش ⚏ استره؛ تیغ موتراشی

**گوزرە** / guzre/: ☜ گورزە-١

**گوزڤان** / guzvan/: ☜ گشتانە-٢

**گوزگی** / guzgî/: ناو. ئاوێنە؛ ئەینووک ⚏ آیینه

**گوزلی** / guzlî/: ناو. *[ناشیرین]* گیزلی؛ قاحبەی بە دزییەوە ⚏ فاحشەی پنهانی

**گوزم** / guzm/: ناو. خوڕڕەم؛ بارانی بەهێز ⚏ رگبار

**گوزمیچک** / guzmîçik/: ناو. گوزمیرچک؛ مزارح؛ خولخولە ⚏ فرفره

**گوزمیرچک** / guzmîrçik/: ☜ گوزمیچك

**گوزوگومبەت** / guz û gumbet/: ئاوەڵکار. گزوگوم؛ گزوگومەت؛ گوز؛ گۆزوگومبەت؛ گزوگومبەت؛ لەپڕ و نەکاو ⚏ ناگهان؛ یکهو

**گوزوگومەت** / guz û gumet/: ئاوەڵکار. لەپڕ؛ هیکا؛ لە پڕێکا ⚏ ناخودآگاه

**گوزوور** / guzûr/: ناو. چارە؛ ڕێچار؛ عیلاج ⚏ گزیر؛ چاره

**گوزەر**[١] / guzer/: ناو. ١. ڕاستەبازاڕی سەرداپۆشراو ٢. کاری ڕابردن؛ بوورین؛ تێپەڕین ⚏ ١. راستەبازار سرپوشیده ٢. گُذر؛ عبور

⊡ **گوزەر دان**: ١. ڕەوانە/ بەڕێ کردن ٢. بوار دان (چەم) ‹چەمەکە زۆر خوڕە، گوزەر نادا› ⚏ ١. راهی کردن ٢. گُدار دادن (رودخانه)

**گوزەر کردن**: ڕابردن ⚏ گُذشتن

**. گوزەر**[٢]: پاشەوشە. بوار ‹ڕێ‌گوزەر› ⚏ ـ رو؛ ـ گُذر

**گوزەران**[١] / guzeran/: چاوگ. تێپەڕ. //گوزەرای؛ دەگوزەری؛ بگوزەرە// گوزەریان: ١. ڕابردن؛ تێپەڕین ٢. بەخشین؛ بوورین ⚏ ١. عبور کردن ٢. گُذشت کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: گوزەراو/ چاوگی نەرێنی: نەگوزەران

**گوزەران**[٢]: ناو. ١. ڕەوتی ژیان بەڕێوە چوون ‹هەر کەس هەولیەتی بۆ گوزەرانێ/ پێک بێنێ بۆ خۆی

نیمچە ژیانێ «فولکلۆر»› ۲. بژیو؛ داژیار؛ مایەی ژیان ⊑ ۱. امرار معاش ۲. مایەی زندگی

▣ **گوزەران سەگ** *[کنایه]* ۱. ژیانی سەگی و زۆر ئاستەم ‹گوزەران سەگم هەس بە دەسیانەو› ۲. ئەستەم و چەتوون ‹ئەمە کار نییە، گوزەران سەگە!› ⊑ ۱. زندگی سگی ۲. دشوار

▣ **گوزەران کردن**: گوزەراندن: ۱. ژیان تێپەڕین ‹یا ڕەب گوزەران کا بە سەفا وەختی عەزیزت/ پەیوەستە لە دەوری چەمەن و گەردشی باغا «شێخ ڕەزا»› ۲. خۆش ڕابواردن ‹چووگەسە ناو حیزب گوزەران ئەکا› ۳. دەربردن ‹بەم سەرمایە، ئەم زۆسانە گوزەران ناکەین› ⊑ ۱. زندگی گُذشتن ۲. خوش گُذراندن ۳. دربُردن

**گوزەراندن / guzerandin**/: چاوگ. تێپەڕ. //گوزەراندت؛ دەگوزەرێنی؛ بگوزەرێنە// گوزەرنای؛ گوزەران کردن: ۱. ڕابواردن؛ دانە سەر ‹نیوەی ژیانی لە زیندانا گوزەراندووە› ۲. خۆش ڕابواردن ⊑ ۱. گُذراندن ۲. خوش گُذراندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـــ/ چاوگی نەرێنی: نەگوزەراندن

**گوزەرگا / guzerga**/: ناو. ۱. بواری ڕووبار ۲. ڕێگا ⊑ ۱. گُدار رودخانە ۲. محل عبور

**گوزەرنامە / guzername**/: ☜ **پاساپۆرت**

**گوزەرنای / guzernay**/: ☜ **گوزەراندن**

**گوزەریان / guzeryan**/: ☜ **گوزەران**[1]

**گوزەریای / guzeryay**/: چاوگ. گوزەران ⊑ گذشتن

**گوزەشت / guzeşt**/: ناو. چاوپۆشی؛ ڕەوتی لێبووردن ⊑ چشمپوشی

▣ **گوزەشت کردن**: بەخشین؛ بوورین ⊑ عفو کردن

**گوزەشتە / guzeşte**/: ناو. ڕابردوو؛ ڕۆژگاری بووری ⊑ گُذشتە

**گوزیدان / guzîdan**/: ناو. یەکیەتی؛ دۆخی یەک بوون ⊑ اتحاد

**ـ گوژ / guj-**/: پاشگر. کوژەر ‹پیاوگوژ› ⊑ ـ کُش

**گوژالک / gujalik**/: ☜ **گوژاڵك**

**گوژاڵک / gujałik**/: ناو. گووژەڵ؛ گوژالک؛ گونەسر؛ کاڵەکەمارانە ⊑ هندوانەی ابوجهل

**گوژان / gujan**/: چاوگ. گوژران؛ کوژران؛ کوژیان؛ کوشران ‹... لە دۆتی زیندەبەگۆڕیش پرسیار کرا: بە کیژان گونەه گوژاوە ؟ «هەژار، *قورئان*»› ⊑ کُشتە شدن

**گوژاننەوە / gujannewe**/: ☜ **کوژاندنەوە**

**گوژانەوە / gujanewe**/: چاوگ. ۱. کوژانەوە ۲. سەر برین ⊑ ۱. خاموش شدن ۲. سر بُریدن

**گوژاو / gujaw**/: ☜ **کوژراو**

**گوژاوێ / gujawê**/: ناو. جەوی؛ شیلەی دار و گیا ⊑ انگُم

**گوژتن / gujtin**/: چاوگ. کوشتن ⊑ کشتن

**گوژران / gujran**/: ☜ **گوژان**

**گوژراو / gujraw**/: ☜ **کوژراو**

**گوژم**[1] **/ gujm**/: ناو. ۱. تەکانی بەتەوژم ۲. هێز و توان ۳. هێرش؛ پەلامار ⊑ ۱. جهش ۲. تاب و توان ۳. یورش؛ هجوم

**گوژم**[2]: ئاوەڵناو. ۱. ڕەق؛ سەخت ۲. زبر؛ زرو ⊑ ۱. سخت ۲. زبر

**گوژمە**[1] **/ gujme**/: ناو. ۱. میوەی کوتراوی هەڵگیراو بۆ پێخۆر ۲. ئەندازەیەکی گرینگ ‹لە پارە و هەرچی› ۳. گرد؛ تەپۆلکە ⊑ ۱. میوەی خُشکیدەی کوبیدە ۲. مقداری چشمگیر ۳. تپە

**گوژمە**[2]: ئاوەڵناو. گورج؛ چالاک ⊑ چُست و چالاک

**گوژمی / gujmî**/: ناو. ڕەقی؛ سفتی؛ سەختی ⊑ سختی؛ سفتی

**گوژنو / gujnû**/: ناو. گوژنە؛ گۆژنەوە: ۱. زارئاخنی گوزە و دیزە ‹دەرە گوژنوو› ۲. دەرخۆنە؛ سەرپۆشی دەفر ۳. دەسکی دەرخۆنە ⊑ ۱.

دهانەبند دیزی و سبو ٢. نهنبان؛ درِ ظرف ٣. دەستەی نهنبان

**گوژنە** / gujne/: ☜ **گوژنو**

**گوژنەو** / gujnew/: ناو. باڵگە؛ سەرین؛ سەنیر ☰ بالش

**گوژە** / guje/: ناو. عەنزەرووت ☰ انزروت

**گوژەر** / gujer/: ناو. مێرکوژ؛ پیاوکوژ ☰ آدمکش؛ قاتل

**گوژەگوژ** / gujeguj/: دەنگ. هاژەی ئاو، دەنگی ڕۆیشتنی ئاوی چەمی خوڕ ☰ صدای جریان سریع آب

**گوژیلە** / gujîle/: ناو. چرپی بۆ دارەڕا ☰ انبیره

**گوژین** / gujîn/: چاوگ. ١. لوور بوون؛ بە تەوژم لە سەرڕا هاتنە خوار ٢. با بە هێزەوە هاتن ☰ ١. سرازیر شدن ٢. تُندباد آمدن

**گوساخ** / gusax/: ناوەڵناو. گوستاخ؛ ڕووقایم؛ شەرمنەکەر ☰ گُستاخ

**گوساخی** / gusaxî/: ناو. گوستاخی؛ ڕووداری ☰ گستاخی

**گوساڵ** / gusał/: ☜ **گوێرەکە**

▣ **گوساڵ گامێش**: پالاخ؛ گوێلکی گامێش ☰ گوسالەی گاومیش

**گوسان** / gusan/: ناو. لاوکبێژی گاتاکان ☰ خوانندەی گاتها

**گوست** / gust/: ناو. ئەنگوست؛ تبل؛ تلی؛ تل؛ قامک؛ کلک؛ پەنجە ☰ انگشت

**گوستاخ** / gustax/: ☜ **گوساخ**

**گوستاخی** / gustaxî/: ☜ **گوساخی**

**گوستیرک** / gustîrik/: ناو. ئەنگوستیلە ☰ انگشتانە

**گوستیل** / gustîl/: ☜ **گشتانە١و٢**

**گوستیلانێ** / gustîlanê/: ناو. گوستیلکانێ؛ کالەمستێن؛ پشکیلان ☰ گُل یا پوچ

**گوستیلک** / gustîlik/: ☜ **گشتانە١**

**گوستیلکانێ** / gustîlikanê/: ☜ **گوستیلانێ**

**گوستیلە** / gustîle/: ☜ **گشتانە١و٢**

**گوسک** / gusk/: ☜ **گۆزەڵە**

**گوسنج** / gusinc/: ☜ **سرینچك**

**گوش**[1] / guş/: ناو. ١. گوچ؛ ژەک؛ فرچک ٢. پارچەی تەلیس؛ پارچەی لە پرزەی ڕوەک ☰ ١. آغوز ٢. گونی؛ چتایی

▣ **گوش کردن**: ☜ **گۆش کردن**

▪ **گوش**[2]: پاشەوشە. ـ گووش؛ بگوش ‹تریگوش؛ فیشەکگوش› ☰ افشرندە؛ فشاردهندە

**گوشا**[1] / guşa/: ناوەڵناو. ئاواڵە؛ کراوە ☰ باز

▪ **گوشا**[2]: پاشەوشە. ڕاییکەر ‹موشکولگوشا؛ دلگوشا› ☰ ـ گُشا؛ گُشایندە

**گوشاب** / guşab/: ناو. خۆشاو؛ خوەشاو ☰ میوەی خشک خیساندە در آب

**گوشاد** / guşad/: ناوەڵناو. ١. فرەوان؛ فرەھ ٢. ئاواڵە؛ کراوە ☰ ١. گُشاد ٢. باز

**گوشادی** / guşadî/: ناو. ١. فەرحانی؛ هەرزانی و زۆری بژیو ٢. ڕزگاری لە بەلا؛ تێپەڕینی دۆخی نالەبار ‹هەموو نووری ژیانە فەیز و نووری ئاسمانی شین/ هەموو چەپلەی گوشادی لێ ئەدەن هەرچی کە ئەیبینی «دلدار»› ☰ ١. ارزانی ٢. گُشایش

**گوشار** / guşar/: ناو. تەوژم؛ فشار؛ پالەپەستۆ ☰ فشار

**گوشان** / guşan/: چاوگ. ١. ☜ **گوشین** ٢. تلیت/ تریت کردن؛ نان دە ناو شۆربا کردن ☰ ١. ☜ **گوشین** ٢. ترید کردن

**گوشانن** / guşanin/: ☜ **گوشین**

**گوشپان** / guşpan/: ☜ **گشتانە٢**

**گوشپل** / guşpil/: ناو. پشکەڵ؛ پشقل ☰ پشکل

**گوشران** / guşran/: چاوگ. تێنەپەر. نادیار. //گوشرای؛ دەگوشرێی؛ بگوشرێ// گوشیان؛ کوشران ☰ فشردە شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: گوشراو/ چاوگی نەرێنی: نەگوشران

**گوشراو** / guşraw/: ئاوەڵناو. گوشیاگ؛ گوشیاو؛ گوشیو؛ گوڤاشتی؛ کوشراو ☰ فشرده

**گوشک** / guşk/: ☜ **گۆیژ**

**گوشگەنە** / guşgene/: ناو. کاری شی کردنەوەی کوڵکە ☰ عمل از هم جدا کردن پشم و پنبه

**گوشگیرە** / guşgîre/: ☜ **گۆشەگیرە**

**گوشڵێ** / guşłê/: ناو. گۆشتەندووری ☰ نوعی دیزی

**گوشمە** / guşme/: ناو. ١. میوەی تێکەڵکراوی کوتراو ٢. قەزوانی لە جوندا هاڕدراوی سەلککراو کە بۆ پێخۆری زستان هەڵدەگیرێ ☰ ١. میوەی کوبیده شده ٢. پستەکوهی خشک و خُرد شده، برای مصرف زمستان

**گوشوەن** / guşwen/: ناو. بەندی پێشە؛ جەمسەری ئێسکان ☰ بند استخوان

**گوشەک** / guşek/: ناو. ئالوو؛ لەوزە ☰ لوزتین

**گوشیاگ** / guşyag/: ☜ **گوشراو**

**گوشیان** / guşyan/: چاوگ. ١. ☜ **گوشین** ٢. ☜ **گوشران**

**گوشیاو** / guşyaw/: ☜ **گوشراو**

**گوشین** / guşîn/: چاوگ. تێپەڕ. //گوشیت؛ دەگوشی؛ بگوشە// گڤاشتن؛ گوشان؛ گوشانن؛ گوشیان؛ گوڤاشتن؛ گۆشین؛ گووشین؛ گۆڤشاندن؛ کوشین؛ بە هێزێکی میکانیکی بە سەر ڕووبەری شتێکدا گوشار هێنان ☰ فشُردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەگوشین

**گوشینگە** / guşînge/: ناو. گڤاشگە؛ گوڤاشتەک؛ گوڤاشگە؛ جێگەی میوە گوشین ☰ معصره؛ جای فشُردن میوه

**گوشیو** / guşîw/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **گوشراو** ٢. وردکراو؛ هاڕدراو؛ هاڕیاگ ‹تێم گوشیوە› ☰ ١. ☜ **گوشراو** ٢. ریز و نرم‌شده

**گوفک** / gufik/: ☜ **گوفك ـ١**

**گوڤ** / guv/: ☜ **گڤڤە**

**گوڤا** / guva/: ئاوەڵکار. هێدیکا؛ بە لەسەرخۆیی؛ بە سەبرۆکە ☰ به آرامی

**گوڤاش** / guvaş/: ناو. کاری گوشین ☰ عمل فشُردن

**گوڤاشتن** / guvaştin/: ☜ **گوشین**

**گوڤاشتەک** / guvaştek/: ☜ **گوشینگە**

**گوڤاشتی** / guvaştî/: ☜ **گوشراو**

**گوڤاشگە** / guvaşge/: ☜ **گوشینگە**

**گوڤا ـ گوڤا** / guva guva/: ئاوەڵکار. وردە ـ وردە؛ کەم‌کەمە ☰ اندک ـ اندک؛ به‌تدریج

**گوڤتاندن** / guvtandin/: چاوگ. ١. کار بەڕێوە بردن ٢. پێداویستی ژیان پێکهێنان ☰ ١. کار را به انجام رساندن ٢. تأمین کردن ضروریات زندگی

**گوڤشک** / guvşik/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی هەر شتێ کە بۆی دەبێ بگوشرێ ☰ فشُردنی

**گوڤڤی** / guvvî/: ناو. قسەی بە مینگە و سرتەوە ☰ من‌ومِن

**گوڤهاندن** / guvhandin/: چاوگ. مەیاندن؛ ئامیان کردنە شیر بۆ ماست و پەنیر ☰ مایه زدن شیر

**گوڤیشک**[١] / guvîşk/: ☜ **گۆیژ**

**گوڤیشک**[٢]: ئاوەڵناو. گووشراو؛ گووشیاگ ☰ فشُرده

**گوڤین** / guvîn/: چاوگ. مەیین؛ گرسان؛ توند بوون (وەک: شیر؛ بوونە ماست یان پەنیر و ...) ☰ بستن (شیر و ...)

**گوگوختی** / guguxtî/: ناو. کۆترەنەخشینە؛ کوکوختی ☰ فاختە

**گول**[١] / gul/: ناو. ١. گول ٢. دێو؛ گەڵ؛ گەڵای وەسەر یەکنراو بۆ لەوەڕی زستانەی ئاژەڵ ٣. ئەوەی تووشی گولی بووە ☰ ١. گُل ٢. برگ‌های انباشته شده برای خوراک زمستانی دام ٣. جُذامی

◙ **گول شەیتان**: قورسی کەمەر ☰ گیاه بلادر

**گولا بەربەرۆژکێ**: ☜ **گوڵەبەرۆژە**

**گولا پاییزێ**: ☜ **گوڵەپاییزە**

**گولا پێغەمبەر**: گولا پێغەمبەر؛ هەلالەبرمە؛ گوڵی شلێرە؛ گوڵێکی سووری ئاڵ یان زەردی پیاڵەئاسای سەرەونخوونە ☰ لالەی سرنگون

**گولا چاوێشە**: ☜ **گوڵەبەیبوون**

**گولا زەر**: ☜ **گوڵەزەردە**

**گولا سۆر**: ☜ **گوڵەباخ**

**گولا شێستپەڕ**: گوڵەئەستەمبولی؛ گوڵێکی پڕ پەلکە بە زۆر ڕەنگان ☰ کوکب

**گول[٢]**: ناوەڵناو. ١. گور؛ خۆرە تێکەوتوو ‹گول دەسەبرای پیسە «مەسەل»› ٢. پووتەکە و بێنموود ٣. تامناخۆش ٤. [مەجاز] پیس و پۆخڵ ٥. دەرکەوتوو لە یاری چاوشارەکێدا ☰ ١. جُذامی ٢. حقیر و بی‌نمود ٣. بدمزه ۴. کثیف ۵. لو رفته در بازی قایم‌باشک

▣ **گولی دور ئاوایی**: [کینایە] خۆ لە خەڵک دوورخەرەوە و بەشدار نەبوو لە شایی و شینیان ☰ مُنزوی

▣ **گول کردن**: ١. تووشی نەخۆشی گولی کردن ‹زۆر پیسە، بیخۆی گولت دەکا› ٢. [کینایە] پیس و پۆخڵ کردن * هەروەها: **گول بوون** ☰ ١. بە جُذام مبتلا کردن ٢. کثیف کردن

**گولابەتون** / gulabetûn/: ☜ **گوڵاوەتون**

**گولاتی** / gulatî/: ناو. قەرەقووچ؛ کلکەتووتە؛ قامکەچکۆلە ☰ خنصر

**گولاچاوێشە** / gulaçawêşe/: ☜ **گوڵەبەیبوون**

**گولاش** / gulaş/: ☜ **گوڵەش**

**گولاڤ** / gulav/: ☜ **گوڵاو[١]**

**گولاڤدون** / gulavdûn/: ☜ **گوڵاوەتون**

**گولال** / gulal/: ناو. ١. مۆزەشینە کە گا و گۆل ڕاو دەنێ ٢. مێروویەکی ڕەشە وەک سن دەچێ ☰ ١. خرمگس ٢. حشره‌ای شبیه به سن

▣ **گولالازەرێن**: مێشێکی کەسکە لە جەنگەی گەرمادا لە داران زیان دەدا ☰ نوعی مگس سبز، آفت درختان میوه در فصل گرما

**گولالاگێ**: کرمی زگ ☰ انگل شکم

**گولالە** / gulale/: ☜ **گەلاڵە**

**گولالێ** / gulalê/: ناو. تووتە؛ قامکە چکۆلە ☰ خنصر؛ انگشت کوچک

**گولان** / gulan/: ☜ **گوڵان**

**گولانگ** / gulang/: ناو. گولی؛ گولە؛ کەزی وەهۆنراو؛ ☰ زلف بافته

**گولانە** / gulane/: ناوەڵناو. ١. ژەهراوی ‹کارگە گولانە› ٢. پووتەکە و بێنمود ☰ ١. سمی ٢. کوچولوی بدریخت

**گولاوە** / gulawe/: ناو. کفتەی برنجی ☰ کوفته‌برنجی

**گولاوێژ** / gulawêj/: ☜ **گەلاوێژ**

**گولباخە** / gulbaxe/: ناو. بەڕیز وێستانی هەردوو لای یاری (وەک: لە کایەی داروکە چەقاندن و هەڵگرتنەوەدا) ☰ عمل صف بستن دو گروه مقابل در بازی

**گولباڤ** / gulbav/: ناو. ١. سووری ئاڵ بە ڕەنگی گوڵ ٢. خونچە ☰ ١. گُلفام؛ صورتی ٢. غُنچه

**گولبزا** / gulb(i)za/: ناو. گولبزک؛ گوڵەنەورۆزە ☰ گلی زردرنگ که اول بهار می‌شکفد

**گولبزک** / gulbizik/: ☜ **گولبزا**

**گولبۆری** / gulborî/: ناو. گوڵی شەیپووری ☰ گل اطلسی

**گولبەژن** / gulbejn/: ناوەڵناو. قەدباریک؛ بەژنزراڤ ☰ گُل‌اندام؛ کمرباریک

**گولبهار** / gulb(i)har/: ناو. گوڵێکی سەوزی پڕ پەلکە ☰ گل ماهوتی

**گولتە** / gulte/: ناو. چەلاک؛ کۆلەکە ☰ ستون

**گولچان** / gulçan/: ناو. پیشکان؛ داری سەردادراو

بۆ کەنگر کەندن 🇮🇷 چوبدستی مخصوص کنگرکنی

**گوڵچمک / gulçimk/**: ئاوەڵناو. تەواو نەشێلدراو (هەویر و قوڕ) 🇮🇷 نیم سرشته (خمیر و گل)

**گولچیت / gulçît/**: ناو. گوڵێکی دەشتەکییە 🇮🇷 از گل‌های صحرایی

**گوڵچیچەک / gulçîçek/**: ناو. هەموو گوڵی کورتەباڵای دەشتی، بە تێکڕایی 🇮🇷 گل‌های کوتاه صحرایی به طور عام

**گولچیسک / gulçîsk/**: ☜ **گورچیلە**

**گولچیلە / gulçîle/**: ☜ **گورچیلە**

**گولخار / gulxar/**: ☜ **گوڵخار**

**گولخەنی / gulxenî/**: ناو. ١. پیرخەنی؛ شلەی وردە بڕوێش ٢. گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ 🇮🇷 ١. آش بلغور ریز ٢. گیاه بسم

**گولخیڤ / gulxîv/**: ناو. دەمی پشکووتنی گوڵان 🇮🇷 موسم دمیدن غنچەها

**گولدووزام / guldûzam/**: ئاوەڵناو. شڵە؛ دەموچاو پەڵە ـ پەڵە 🇮🇷 کَک‌مَکی؛ دارای صورت پُر لکه

**گوڵزار / gulzar/**: ☜ **گوڵزار**

**گوڵشەن / gulşen/**: ☜ **گوڵشەن**

**گوڵشێن / gulşên/**: ☜ **گوڵشەن**

**گولشێنی / gulşênî/**: ناو. قامێکی کوردییە 🇮🇷 ترانەای کُردی

**گولک / gul(i)k/**: ناو. گوێلک؛ گوێرەکە 🇮🇷 گوساله

▣ **گولکا حەلی**: گوێلکی زوو زاوی هەراش 🇮🇷 گوسالەی زود به دنیا آمده

**گولکوشی / gulkuşî/**: ناو. کاری بە خۆ هەڵگوتن لە زۆرخانەدا 🇮🇷 رجزخوانی در زورخانه

**گولکە / gulke/**: ناو. جۆرێ ترێ 🇮🇷 نوعی انگور

**گولکەڤرۆک / gulkevrok/**: ☜ **گڵەوەز**

**گوللان / gullan/**: ناو. هەڵماتێن؛ ماتان؛ مێشان؛ وازی بەکەللا 🇮🇷 تیلەبازی

**گوللە / gulle/**: ناو. گولە؛ بەرک؛ تیر؛ تەنێکی خڕیلەی کانزایی لە نووکی فیشەکدا 🇮🇷 گلوله

▣ **گوللەی وێڵ**: گوللە/ گولەی وێڵەکی؛ گوللەیەک کە بێ‌ئامانج گرتن تەقیوە 🇮🇷 گلولەی بی هدف رها شده

**گوللەی وێڵەکی**: ☜ **گوللەی وێڵ**

**گوللەباران / gullebaran/**: ناو. گولەباران؛ فیشەکباران؛ کاری لە سەر یەک هاویشتن و تەقاندنی گوللە ‹مەتەرێزەکەمان لە هەموو لایێکەوە گوللەباران کرا› 🇮🇷 گلولەباران

**گوللەبەن[1] / gulleben/**: ناو. گوللەبەند؛ دوعای خۆ پارازتن لە گوللە 🇮🇷 دُعای ضد گلوله

**گوللەبەن[2]**: ئاوەڵناو. گوللەبەند؛ دژەگوللە؛ گوللەنەبڕ ‹جانتای گوللەبەن› 🇮🇷 ضدگلوله

**گوللەبەند / gullebend/**: ☜ **گوللەبەن**

**گوللی / gullî/**: ناو. ١. بیبیلەی چەم ٢. دەنکەترێ 🇮🇷 ١. مردُمک چشم ٢. حبّەی انگور

**گولم / gulm/**: ناو. ١. پەنجەی قووچاو ٢. گۆم؛ ئاوی ڕاوەستاوی قووڵ 🇮🇷 ١. مشت گره کرده ٢. آب ژرف و راکد

**گولملیزی / gulmlîzî/**: ناو. شەڕەمشت 🇮🇷 بوکس

**گوڵمەخموور / gulmexmûr/**: ☜ **گوڵمەخموور**

**گوڵمەشک / gulmeşk/**: ناو. گیای پەقەڵە 🇮🇷 گل رجل‌الغراب

**گولنک / gulink/**: ناو. *[شوورەیی]* بەلۆکە؛ مێتکە؛ قیتکەی زێ 🇮🇷 چوچوله

**گوڵوەردەخ(ی)وەر / gulwerdex(i)wer/**: ☜ **گوڵەبەڕۆژە**

**گولوەن / gulwen/**: ناو. ١. خشڵی ئەستۆ ٢. ئەستۆپێچی لە قوماش 🇮🇷 ١. گردنبند ٢. شال‌گردن پارچەای

**گولوەنی / gulwenî/**: ناو. چارۆکە 🇮🇷 شِنِل زنانه

**گولۆر / gulor/**: ئاوەڵناو. خلار؛ گلار؛ تلار؛ گلۆر؛ بەگل و خول. هەروەها: **گولۆر بوونەوە؛ گولۆر**

کردنەوە ﷼ غلتان

**گولۆڤەر** / gulover/: ☜ **گرۆڤەر**

**گولـۆک** / gulok/: ناوەڵـناو. گزمووڵـە؛ خـڕی زۆر پچووک ﷼ مُدور کوچک

**گولو**[1] / gulû/: ناو. دەنکەترێ ﷼ دانەی انگور

**گولو**[2]: دەنگ. دەنگی هەرا کردن و بانـگ کـردنی گوێرەکە (زۆرتر لەگەڵ چەن‌پاتـە بوونەوەیدایـە) ﷼ صدای فراخواندن گوساله

**گولو ـ گولو**[1] / gulû gulû/: ناوەڵکار. دانار ـ دانـار؛ دەنک ـ دەنک ‹ماستاوێکی گولوو ـ گولووی هێنا› ﷼ دانه ـ دانه

**گولـو ـ گولـو**[2]: دەنـگ. هـەرای بانـگ کـردنی گوێرەکە ﷼ صدای فراخواندن گوساله

**گوله**[1] / gule/: نـاو. ١. پارچەی زەوی پچـووک ٢. *[پلار]* پیاوێ کە ژنی جوانی هەیـە و ئێرەیـی پـێ دەبەن ‹مێردە گولەکەت قەدرت نازانێ/ زێڕ لە ملـی سەگدا بایەخی کوانێ «فولکلۆر»› ٣. ☜ **گوللـە** ٤. گولانگ؛ گولی؛ پرچی وەهۆندراو ﷼ ١. قطعه زمین کوچک ٢. شوهرِ زن زیبا که به وی حسودی کنند ٣. ☜ **گولله** ٤. زلف بافته

▣ **گولەی وێڵەکی**: ☜ **گوللەی وێڵ**

**گوله**[2]: ناوەڵناو. پووتەکەی پیسەکە ﷼ حقیر بدنمود

**گولەباران** / gulebaran/: ☜ **گوللەباران**

**گولـەش** / guleş/: نـاو. گمـش؛ گـوارش؛ گـوراش؛ گــولاش؛ گــەمش؛ زۆران؛ زۆرانی؛ زۆرەبــانی؛ زۆرەبانێ؛ بنکەفشانێ؛ عەردانێ؛ ملانـە؛ ململانـە؛ ململانێ؛ دەفرە؛ عەفرە؛ کۆچـە؛ وەرزشـێکی دوو کەسـیيە هـەر کـەس ئـەوی‌تـر لـە زەوی بـدا بردوویەتەوە ﷼ کُشتی

**گولەک** / gulek/: ناو. گیایەکە ئاژەڵ بیخوا بای پێ دەکا ﷼ گیاهی که موجب باد کردن حیوان می‌شود

**گولـەکـە** / guleke/: نـاو. فـنجڵ؛ بۆرەپیــاو ﷼ آدم بی‌ارزش

**گولەمێش** / gulemêş/: ناو. گیای دەرمانی کرم ﷼ گیاهی ضدکرم

**گولەنیسـان** / gulenîsan/: نـاو. چارەچەقیلــە ﷼ نوعی خشخاش

**گولی** / gulî/: ناو. ١. نەخۆشـی خـۆرە ٢. گولـی خەلــە ٣. لقــی دار ٤. کــەزی؛ پرچــێ کــە دەهۆنرێتەوە ٥. کلووی بەفر ٦. گولینگەی شەدە و پێچی سەر ﷼ ١. بیماری جُذام ٢. خوشه‌ی غله ٣. شاخه‌ی درخت ٤. گیسوی بافتـه ٥. دانـه‌ی بـرف ٦. منگوله‌ی سرپوش

**گولیچ** / gulîç/: ناو. گولی؛ کلووی بـەفر ﷼ دانـه‌ی برف

**گولیستان** / gulîstan/: ☜ **گوڵستان**

**گولیفک** / gulîfik/: ناو. گولی؛ گوڵێکی زۆر جوانـە ﷼ از گل‌های بسیار زیبا

**گولیڤک** / gulîvik/: ناو. گولینگەی شەدە و پێچی سەر ﷼ منگوله‌ی روسری

**گولیک**[1] / gulîk/: ناو. کوتیلـک؛ کفتـەی سـاواری سوورەوەکراو ﷼ کوفته‌ی بلغور سرخ‌کرده

**گولیک**[2]: ناوەڵناو. سەرتەنک؛ کەمموو ﷼ کم‌پشت

**گولێر** / gulêr/: نـاو. ١. جـۆرێ بـەری مـازوو ٢. دەروازەوان؛ یاریزانـێ کـە لـە دەروازەیـە، تـۆپی تێ‌نەچێ ﷼ ١. نوعی ثمر مازوج ٢. دروازه‌بان

**گوڵ** / guł/: نـاو. ١. گـوڵ؛ چیچـەک؛ گولیـک؛ گلووک؛ کولیـک؛ نـەترک؛ خونچـەی پشـکوتوو؛ ئەندامی زاوزێی گیـای گوڵـدار ‹گوڵـە هـەنار› ٢. ☜ **گوڵـەبـاخ** ٣. بنچکـە گیایەکـە بـۆ جـوانی ڕایدەگرن ‹گوڵی گوێ‌فیـل› ٤. گوڵـی دەغـڵ ٥. پۆلوو؛ سکڵ؛ پـەنگر؛ پـەرەنگ ٦. گـڕی ئـاگر ٧. *[وەرزش]* گۆڵ؛ کاری تـۆپ خسـتنە دەروازە (لـەو یاریانەی کە تۆپ دەچێتە ناو دەروازە یان شـتێکەوە) ٨. کاری دۆزینەوەی پشکیل لە گۆرەوی‌بازیدا ٩. نەخشی چێندراو (وەک: پارچە، فـەرش و ...) ١٠.

[کینایە] مرۆی بـاش و خۆشەویسـت ☰ ١. گُـل ٢. ☜ گولّەباخ ٣. گیاه گُلدانی ۴. خوشەی غلّە ۵. اخگر ۶. شـعله؛ زبانـەی آتـش ٧. گُـل (بـازی و ورزش) ٨. اصطلاحی در جوراب‌بازی ٩. نقش بافتنی (پارچە، قالی و ...) ١٠. آدم نمونە و محبوب

▣ **گوڵی سەرتۆپ:** جوانتر لە ناو شـتی دەوروبـەردا ☰ گُل سرسبد

**گوڵی مەجلیس:** [کینایە] مرۆی قسـەخۆش و کـۆڕ ڕازێنەوە ☰ مجلس‌آرا

▣ **گوڵ چنینەوە:** هەڵگرتن و کۆ کردنەوەی گوڵـی بەجێ ماوی دەخڵ دوای درەو ☰ خوشەچینی

**گوڵ کردن:** ١. گوڵ پشـکووتن لـە دار و گیـا ٢. جێگەی دان لە شینی دانەوێڵە پەیدا بـوون ٣. [وەرزش] گوڵ لێدان؛ تۆپ خستنە نـاو دەروازە، سەبەتە یان زەوینی بەرامبەرەوە ‹تیمـی ئێمـە دوو گوڵی کرد› ٤. [کینایە] هاتنە سـەر کـەیف و دڵخۆش بوون ٥. [کینایە] ئاشکرا بوون ٦. [کینایە] کارێکی گرنـگ دەسـت‌پـێ‌کـردن ☰ ١. گُـل/ شکوفە کردن ٢. خوشە کردن غلە ٣. گُـل زدن ۴. سرکیف آمدن ۵. آشکار شدن ۶. کـاری مهمـی را شروع کردن

**گوڵ گـرتن:** ١. گوڵ پشکووتن لـە دارە گـوڵ ٢. سەری فتیلەچرا و شەم قرتاندن ٣. دە ژێر گڵ خستنی خرچە بۆ ئەوە بێتە کاڵەک ☰ ١. گل شکفتن از گلبن ٢. چیدن فتیلەی چراغ و شـمع ٣. در زیر خاک نهادن خربُزەی نارس برای رسیدن

**گوڵ نان:** لق یان شەتڵی گوڵ لە خـاک نـان ☰ گُل کاشتن

**گوڵی کەس/ شتێک کـاڵ بونەوە:** [کینایە] تووشـی کەمترین ئازار و زیان بوون ‹با تماشام کـردوێ، خۆ گوڵی کاڵ ناوێتەوە!› ☰ کمترین ضـرر و زیـان وارد شدن

**لە گوڵ ناسکتر/ کەمتر نـەوتن:** لە گـوڵ ناسـکتر/ کالتر نەوتن؛ لە گوڵ کـەمتر نـەگوتن؛ قسـەی ناخۆش نەکردن؛ خراپ بە زاردا نەهاتن ‹نـازانم بۆ تۆراوە، خۆ لە گوڵ ناسکترمان پێ نـەوتووە!› ☰ از گل نازکتر نگفتن

**گوڵئـەسـتێرک / gul'estêrik/:** کورمکـێ شەڤـێ؛ گوڵستێرک؛ گوڵئەستێرە ☰ کرم شبتاب

**گوڵئەستێرە / gul'estêre/:** ☜ **گوڵەستێرە**

**گوڵاباتوون / gułabatûn/:** ☜ **گوڵاوەتوون**

**گوڵاڵە / gułałe/:** ناو. ڕەبەنۆک؛ مێلاقە ☰ آلالە

**گوڵاڵەسوورکە / gułałesûrke/:** ☜ **گوڵاڵەسوورە**

**گوڵاڵـەسوورە / gułałesûre/:** نـاو. گوڵاڵەسـوورکە؛ گوڵاڵە ☰ آلالەی قرمز

**گوڵان / gułan/:** ناو. گـوڵان؛ بانەمـەڕ؛ جـۆەدرەو؛ تێرەخۆەرە؛ بڕینەکەران؛ دووهـەم مـانگی بـەهار؛ مانگی دووهەمی ساڵی هەتاوی ئێران کە ٣١ ڕۆژە ☰ اُردیبهشت

**گوڵاو[1] / guław/:** ناو. گوڵاڤ؛ پنکاڤ؛ بەرکم؛ لـیچ؛ تنۆکـاوی هەڵـمی گوڵـباخی کـە ئـاوێکی زۆر بۆنخۆشە ☰ گُلاب

▣ **گوڵاو گرتن:** گوڵ و ئاو لە سەر ئاگر کوڵانـدن و هەڵمەکەی بە تنۆکـە کـۆ کردنـەوە ☰ گـلاب گرفتن

**گوڵاو[2]:** ☜ **گلاو[2]**

**گوڵاواتوون / guławatûn/:** ☜ **گوڵاوەتوون**

**گوڵاوپـــاش / guławpaş/:** نـــاو. گوڵاوپـــڕژێن؛ گـوڵاودان؛ دەفـری گـوڵاو؛ تـۆنگی گچکـەی دەسکدار و ملباریک بە لوولەیەکـەوە بـۆ گـوڵاو پژاندن بە دەست و سەر و چاودا ☰ گُلابپاش

**گـــوڵاوپڕژێن / guławpiřjên/:** نـــاو. ١. ☜ **گوڵاوپاش** ٢. کاری پرژاندنی گوڵاو بە سەر کەس یان شتێکدا ☰ ١. ☜ **گوڵاوپاش** ٢. گُلابپاشی

**گوڵاودان / guławdan/:** ☜ **گوڵاوپاش**

**گوڵاوەتـوون / guławetûn/:** نـاو. گوڵابـــەتوون؛

گوڵاڤدوون؛ گوڵاباتوون؛ گوڵاواتوون: ١. زرهـۆک؛ باریکە تاڵی زێڕین یان زێوین کە لەگەڵ ئاوریشم بۆ تان و پۆی پارچەی زەڕی بە کاری دەبـەن ٢. زرهۆک؛ تەنراوەیەکی ئاوریشـمی بـە گوڵـەنگەوە کراو، کـە بـە پرچییـەوە هەڵدەواسـن ٣. گوڵـی زۆپی لە تان و پۆی زێڕ و زێو چنراو، کە بە سـەر پارچەیدا دەدروون ☰ ١تا٣. گلابتون

**گوڵاوەی** / guławey/: ☜ **گوڵاوی**

**گوڵاوی** / guławî/: ناو. گوڵاوەی؛ جۆرێ هـەرمێی بۆنخۆش ☰ نوعی گُلابی مُعطر

**گوڵباتمـان** / gułbatman/: نـاو. پارچەیـــەکی قەدیمی ژنانە بوو دەیـانکردە کـراس ☰ پارچـەای قدیمی زنانە

**گوڵباجی** / gułbacî/: ناو. ١. خوشـک؛ خوەیشـک ٢. دش؛ دوش؛ خوشـکی شـوو ☰ ١. خـواهر ٢. خواهرشوهر

**گوڵباخ** / gułbax/: نـاو. ولی؛ گوڵباخ؛ گوڵباخی ☰ گل گلاب

**گوڵبـاخی** / gułbaxî/: نـاو. ١. پنجکێکـــی پایـــای دڕکنە بە گەڵای خڕیلەی کەسکەوە ٢. گوڵگوڵاو؛ گوڵی بەرهەمی ئەو پنجکە بە ڕەنگی ئاڵ و بـۆنی زۆر خۆشـــەوە کـــە گـــوڵاوی لـــێ دەگـــرن و بـــۆ دەرمانیش دەشێ ☰ ١و٢. گل محمدی

**گوڵباران** / gułbaran/: ناو. کاری گوڵ هەڵاویشتن بە سەر کەسێکی عەزیزدا ☰ گلباران

**گوڵبانو** / gułbanû/: ناو. جورێ مێش کە چزووی هەیە ☰ نوعی مگس نیشدار

**گوڵبڕ** / gułbiř/: ناو. دروێنەی سەرچڵی خەڵـە ☰ درو خوشەهای غلە

**گـوڵبزن** / gułbizin/: نـاو. گوڵـــێکە وەک گوڵـــی گوڵاو دەچێ و بێدڕکە ☰ گلی بی خار، شبیە گـل محمدی

**گوڵبژێر**[١] / gułb(i)jêr/: نـاو. گوڵچن؛ گوڵچین: ١. کەسێ کە گوڵ لە دروێنەی خەڵەدا دەچنێتـەوە ٢. *[کینایە]* تەڵبژێر؛ تەڵـبژێن؛ تاڵـچین؛ تەڵـچن؛ سـەرتەڵ؛ سـەرتڵ؛ سـەرگوڵ؛ ئـەوی لـە نـاو کۆمایەکـدا هەڵـبژێردراوە ☰ ١. خوشـەچـین ٢. گُلچین

▣ **گـوڵبژێر کـردن**: *[کینایـە]* تەڵـــبژێر کـــردن؛ هەڵبژاردن ‹گوڵبژێریکی زەریفم کرد لە نێو باغی خـەیاڵ/ خۆزگـە مـەردێکی ڕەشـید بـۆ شـێخی بخوێندایەوە «حەریق»› ☰ گُلچین کردن

**گوڵبژێر**[٢]: ئاوەڵناو. گوڵـچن؛ گوڵـچین؛ تەڵـبژێر؛ بژاردە؛ هەڵبژاردە؛ باشترین لە نـاو کۆمایەکـدا ☰ برگُزیدە

**گوڵبوێر** / gułb(i)wêr/: ناو. ↓

▣ **گوڵبوێر نەکردن**: *[کینایە]* پشت گـوێ نەخسـتن ‹هێندە کاری جوانە! قـەت گـوڵبـوێری ناکـا› ☰ پشت گوش نیانداختن

**گوڵبـۆری** / gułborî/: ناو. گوڵـەحەریرە؛ ئەتڵەسـی ☰ گُل اتلسی

**گوڵبەدەم** / gułbedem/: ئاوەڵناو. گوڵوەدەم؛ تـازە دەرهاتوو ‹خەیاری گوڵبەدەم› ☰ نورس

**گوڵبەڕۆژ** / gułbeřoj/: ☜ **گوڵەبەڕۆژە**

**گوڵبەند** / gułbend/: ناو. چەلینگ ☰ گیاهی است

**گوڵبەهار** / gubehar/: نـاو. چیچـەکی دەشـت ☰ گُل صحرایی

**گوڵبێچـو** / gułbêçû/: نـاو. قوماشـێکی قـەدیمی دەیانکردە کراسی ژنانە ☰ پارچەای قدیمی

**گوڵبێن** / gułbên/: ناو. زار؛ گلۆ ☰ دهانە

**گوڵبێنئاخن** / gułbên'axin/: نـاو. گلبێنە؛ گلوێنە؛ گلواخن؛ گوڵێنەئاخن؛ تۆپە پەڕۆیێ کە دەخرێتە گوڵـبێنەی تەنـدوورەوە بـۆ دامرکانـدنی گـڕی تەندوورەکە ☰ گلوبند تنور

**گوڵبێنـە** / gułbêne/: ناو. گلبێنە؛ گلوێنە؛ گوڵـوە؛ گولوێنە؛ گولۆ؛ گۆلۆ؛ گولۆنە؛ گوڵێنە؛ کونێکە لـە

بنەوەی تەنووردا بابوێری دەرخراوەتە دەر بۆ گڕ خۆش بوونی تەندوور ▪ گلوەی تنور

**گوڵپ** / gulp/: ناو. قوم؛ قم؛ فڕ ▪ جُرعه

**گوڵپرچن** / gulpirçin/: ناو. قەرە؛ ئەو خرچەیەی هەر لە بێستانەکەدا بە بڕکەکەیەوە دەیخەنە بن گڵ تا دەبێتە کاڵەک ▪ خربزەی کال که در جالیز زیر خاک می‌کنند تا برسد

**گوڵپۆش** / gulpoş/: ناو. بەشی دەرەکی گوڵ کە پەرچەم و مێوینەکەی دادەپۆشێ ▪ گلپوش

**گوڵپە** / gulpe/: ناو. کڵپە؛ گڕی لەپڕی ئاگر ▪ اشتعال ناگهانی آتش

**گوڵپەڕ** / gulpeř/: ناو. ١. وەختی دروێنە هاتنی دەخڵ ٢. پەڕە ڕەنگینەکانی دەوری گوڵ ٣. سۆلان؛ سوولان؛ گوڵەسۆ؛ پلەسۆ؛ ئالفە گیایەکی وەک قامیش، بۆنخۆش، گەلاپان، گوڵسپی، میوە هێلکەیی و خۆش بەرامەیە ٤. میوەی ئەو گیایە کە جۆرێک بەهاراتە ▪ ١. موسم درو غله ٢. گلبرگ ٣و٤. گُلپر

**گوڵپەنا** / gulpena/: ناو. گەنمێ کە درەنگ دەچێنرێ و گوڵ ناکا ▪ گندمی که خوشه ندارد

**گوڵپیتە** / gulpîte/: ناو. گوڵی قانگەلاشک ▪ گُل‌بُتەی کنگر

**گوڵپێس** / gulpês/: ناو. خۆرە؛ خوەرە؛ خیرک؛ پیسی ▪ آکله

**گوڵتۆپ** / gultop/: ☜ **گوڵهەنگ**

**گوڵتووتک** / gultûtik/: ناو. بابوونە؛ گوڵەبەیبوون؛ بەیبوون ▪ گل بابونه

**گوڵتە** / gulte/: ناو. پەلەوەری بچووک ▪ پرندەی کوچک

**گوڵجاڕ** / gulcař/: ناو. شوێنێ کە گوڵی زۆری لێ ڕواوە ‹ئەیبینم ... پەلەیێک گوڵجاڕی گوندەکەی مالیاوا/ سەرپێچی سەریەتی «شێرکۆ»› ▪ گُلزار

**گوڵچن** / gulçin/: ناو. ١. ☜ **گوڵبژێر**[1] ٢. شکڵی گوڵدرووو ▪ ١. ☜ **گوڵبژێر**[1] ٢. گلدوز

**گوڵچنی** / gulç(i)nî/: ناو. لەکاتە؛ گوڵە دەغڵی لە داس پەڕیو کۆ کردنەوە ▪ خوشه‌چینی

**گوڵچیچک** / gulçîçik/: ناو. گوولک؛ گوڵ بەهار ▪ گل صحرایی

**گوڵچین** / gulçîn/: ☜ **گوڵبژێر**

**گوڵخار** / gulxar/: ناو. گولخار: ١. ڕەنگی پەمبەیی؛ چێرەیی ٢. ڕەنگی سوور ▪ ١. صورتی ٢. قرمز

**گوڵخاز** / gulxaz/: ناو. خازی؛ خاز؛ گوڵەهاز ▪ گل شیپوری

**گوڵخانە** / gulxane/: ناو. گوڕنی؛ شوێنی پەروەردەکردنی گوڵ و گیا، بەتایبەت شوێنێکی سەرگیراو بە گەرما و ڕووناهی ڕاگیراوەوە ▪ گُلخانه

**گوڵخونچە** / gulxunçe/: ناو. ١. خونچەی نیوەپشکووتوو ٢. پنجکەیەکی پایایە بە گەڵای وردیلەی کەسکی ئاماڵڕەشەوە ٣. گوڵی بەرهەمی ئەم پنجکە بە ڕەنگی سوور و کەمووکەیێ بۆنی خۆشەوە ٤. *[مەجاز]* نەونەمام؛ تازەلاو ▪ ١. غنچەی نیم‌شکفته ٢و٣. گولبوتەای پایا با گل‌های سرخ و اندکی خوشبو ۴. نوجوان

**گوڵخەندەران**[1] / gulxenderan/: ناو. جۆرێ گوڵ ▪ نوعی گل

**گوڵخەندەران**[2]: ئاوەڵناو. خەنەشیرین؛ بە پێکەنینی جوان و دڵبزوێنەوە ▪ دارای خندەی شکرین

**گوڵدار** / guldar/: ئاوەڵناو. بە نەخش و نیگاری گوڵەوە ‹پارچەی گوڵدار› ▪ گلدار

**گوڵدارڕوو** / guldařû/: ناو. سپێلە؛ سپەرە؛ باوەشێنە ▪ سرخس

**گوڵدان** / guldan/: ناو. گوڵدانک: ١. ئینجانە؛ تەبەک؛ قەحفک؛ دەفری قووڵ و دەمهەراو بۆ ناشتن و بەرهەم هێنانی گوڵ ٢. دەفری میز تێ

کردن ﷼ ١. گُلدان ٢. لگن

**گوڵدانک / gułdanik/:** ☜ **گوڵدان**

**گوڵڕووت / gułřût/:** ☜ **گوڵەڕووتە**

**گوڵڕەنگ / gułřeng/:** ئاوەڵناو. بە ڕەنگی گوڵ ‹چاییەکەت تێکە شەرابی گوڵڕەنگ/ لە دیار بالاکەت شەوم کرد درەنگ «فولکلۆر»› ﷼ گُلی رنگ

**گوڵزاخ / gułzax/:** ناو. ناوی پارچەیەکی قەدیمی ﷼ پارچەای قدیمی

**گوڵزار / gułzar/:** ناو. گولزار؛ گوڵجاڕ؛ گوڵەک ﷼ گُلزار

**گوڵسان / gułsan/:** ☜ **گوڵستان**

**گوڵستان / gułistan/:** ناو. گوڵسان؛ گولیستان؛ گوڵشەن؛ گوڵشێن؛ باخەگوڵ؛ گوڵجاڕ؛ گوڵزار؛ گولزار؛ گوڵەک؛ باغچەی گوڵان؛ باخێ کە گوڵی جۆراوجۆری تێدا پەروەردە دەکرێ ﷼ گُلزار؛ گلستان

**گوڵستێرک / guls(i)têrik/:** کورمکێ شەڤێ؛ گوڵئەستێرک؛ گوڵئەستێرە ﷼ کرم شبتاب

**گوڵسوو / gułsû/:** ☜ **گزنگ**

**گوڵشەن / gułşen/:** ناو. گوڵشەن؛ گوڵشێن؛ گوڵجاڕ ﷼ گلزار؛ گلشن

**گوڵشێن / gułşên/:** ☜ **گوڵستان**

**گوڵعاشقان / guł'aşqan/:** ناو. بادروو؛ تاجخرووس؛ گوڵمەخموور ﷼ تاجخروس

**گوڵف / gułf/:** ناو. گەمەیەکی ولاتانی ئینگلیزیزمان، لە زەوییەکی زۆر گەورە بە ٩ یا ١٨ کونەوە، کە یاریزان بە گۆچانێکەوە لە تۆپێکی گچکەی سپی هەڵئەدا بۆ ناو کونەکان، لە ئاکامدا ئەو کەسە دەیباتەوە کە بە لێدانی کەمتر تۆپەکان بخاتە ناو کونەکانەوە ﷼ گُلف

**گوڵقەن / gułqen/:** ☜ **گوڵقەند**

**گوڵقەند / gułqend/:** ناو. گوڵقەن؛ برێشکەی گەنمەشامی و شیلەی قەند کە تۆپەڵی دەکەن ﷼ شیرەی ذرت

**گوڵکار / gułkar/:** ناو. کەسێ کە گوڵ دەڕوێنێ ﷼ گُلکار

**گوڵکاری / gułkarî/:** ناو. ١. کاری پەروەردەکردنی گوڵ ‹بەردەم خانووبەرەکەیان گوڵکاری کردووە› ٢. باخچەی گوڵ؛ ئەو جێگەی کە گوڵی تێدا نراوە و ڕواوە ‹مەچنە ناو گوڵکارییەکەوە! گوڵەکان پێشێل ئەکەن› ﷼ ١و٢. گلکاری

**گوڵکردوو / gułkirdû/:** ئاوەڵناو. شێنی؛ پشکووتوو ﷼ شکوفا

**گوڵکوچک / gułkuçik/:** ☜ **گڵەوەز**

**گوڵکە / gułke/:** ئاوەڵناو. فتنە؛ ئاژاوەچی ﷼ آشوبگر

**گوڵکێش / gułkêş/:** ناو. چنگانە؛ درمەغ ﷼ چنگک علف

**گوڵگاوزوان / gułgaw(i)zwan/:** ناو. گاوزبان؛ گاوزمان؛ گاوزوان؛ گوڵگاوەزوان؛ گاوەزوان؛ گوڵی گیای گۆزروان کە بۆ ڕەوان کردن، عارەق دەردان و میز هێنان بە کار دێ و سوکنایی‌دەریشە ﷼ گُل گاوزبان

**گوڵگاوەزوان/ gułgawez(i)wan/:** ☜ **گوڵگاوزوان**

**گوڵگزی / gułg(i)zî/:** ناو. گوڵگەز؛ گوڵگەزی؛ سووری ئاماڵڕەش ﷼ سُرخ سیەفام

**گوڵ.گوڵ / guł guł/:** ☜ **گوڵگوڵی**[٢]

**گوڵگولاو / gułguław/:** ☜ **گوڵەباخ**

**گوڵگوڵی**[١] **/ gułgułî/:** ناو. ١. دەشتی پڕ لە هەموو جۆرە گوڵێک ٢. سووری ئاچخ؛ سووری کاڵ ﷼ ١. دشت پر از گل ٢. قرمز روشن

**گوڵگوڵی**[٢]**:** ئاوەڵناو. گوڵ گوڵ؛ بە پەڵەی ڕەنگاوڕەنگەوە ‹دنیا کە گوڵگوڵی بووە، قوربان، ئەتۆش وەرە!/ تالیب بە گوڵ بە! قەیدی چییە گوڵ گوڵی بوێ؟! «نالی»› ﷼ رنگارنگ

**گوڵگۆچێلە / gułgoçêle/:** ناو. کەکرە؛ کرژەڵە؛

تالگ؛ تالگه ☱ تلخه

**گوڵگەز** / gułgez/: ☜ **گوڵگزی**

**گوڵگەزی** / gułgezî/: ☜ **گوڵگزی**

**گوڵگەشت** / gułgeşt/: ناو. ١. باخچە ٢. هەوایەکی گۆرانی و قامێکی کەونارایە ☱ ١. باغچه ٢. آهنگی باستانی

**گوڵگـەنم** / gułgenim/: نـاو. هێشـــووی گـــەنم؛ جێگەی دەنک و دان لە چڵەگەنمدا ☱ گُل گندم

**گوڵم** / gułm/: نـاو. ١. نـەرمایی سـەر سمـت ٢. پڕی دەسـتێک ٣. گـولم؛ پەنجـەی قووچـاو ٤. /کینایه/ گـراوی؛ دڵـبەر ٥. وڵـمە؛ پارچەگۆشـتی بێ‌پێشە ٦. سواڵە؛ دەستە گەنمی دروێنەکراو ☱ ١. نرمی باسن ٢. پُر یک دست ٣. مشت گره‌کـرده ۴. معشوقه ۵. گوشت لُخم ۶. دسته‌ی گندم دروشده

**گوڵمشتک** / gułmiştik/: ناو. گلۆڵەبەن ☱ گلولـەی نخ

**گوڵمە** / gułme/: ناو. وڵمە؛ وڵە: ١. نـەرمایی ڕان ٢. گوڵم؛ پارچە گۆشتی بێ‌ئێسک ☱ ١. نرمی ران ٢. گوشت لُخم

**گوڵمەپت** / gułmepit/: نـاو. کونـەلووت ☱ سـوراخ بینی

**گوڵمەخمور** / gułmexmûr/: ناو. گوڵـەمەخموور؛ گوڵمەخموور؛ بادرو؛ پۆپەکەڵەشێرە؛ گوڵـی پـۆ؛ گوڵێکی سووری چەند پەلکە، لە پۆپەی کەڵەباب دەکا ☱ گُل تاج‌خروس

**گوڵمەڕان** / gułmeřan/: ناو. نەرمایی ڕان ☱ نرمـی ران

**گوڵمەز** / gułmez/: ☜ **گۆڵمەز**

**گوڵمی** / gułmî/: ناو. گۆلکەساوا فێرە گـوانمـژین کردن ☱ تعلیم گوساله‌ی نوزاد به مکیدن پستان مادر

**گوڵمیخ** / gułmîx/: ☜ **گوڵمێخ**

**گوڵمێ** / gułmê/: ناو. ١. گیایەکی پایای چڵ-چڵ و مەیلەو سەوزە، ساقەتەکەی تۆزی چەسپنە و لە نسار دەڕوێ ٢. گوڵی ئەو گیایە کە خانە-خانەی خڕۆکە و نازک و بە ڕەنگـی زەرد و بـێ‌بۆنـە، بـۆ جوانی و ڕازاندنەوە ڕایدەگرن ☱ ١و٢. گیاهی پایا و گُل آن

**گوڵمێخ** / gułmêx/: ناو. گوڵـمیخ؛ سـکە؛ بزمـاری زل لە دار یان لە ئاسن ☱ اخیه

**گوڵمێخەک** / gułmêxek/: ناو. گوڵێکی بۆنخۆشە و زۆر ڕەنگی هەیە ☱ گُل میخک

**گوڵمێو** / gułmêw/: ناو. گیایەکە مرۆ دەیخوا ☱ از گیاهان خوراکی

**گوڵنار** / gułar/: ☜ **گوڵەنار**

**گوڵنـاز** / gułnaz/: ناو. نازناز؛ نازنازی؛ شەرمینۆک؛ گوڵێکی زۆر جوانە لە بەر خۆر دەپشکوێ و چەند ڕەنگـی هەیــە و ئەگــەر دەســتی لــێ بکــەوێ پەڕەکانی لوول دەبن ☱ گُلناز

**گوڵندام** / gułindam/: ☜ **گوڵننام**

**گوڵنگ** / guł(i)ng/: ☜ **گوڵەنگ**

**گوڵنگە** / guł(i)nge/: ناو. /شوورەیی/ بەلۆکە؛ میتکە ☱ چوچوله

**گوڵنم** / gułnim/: ناو. ئاوپڕژێن ☱ آبپاشی

**گوڵننام** / gułinnam/: ناو. گوڵندام ☱ گل‌اندام

**گوڵنیشـان** / gułnîşan/: نـاو. مینـــا؛ گوڵـــەمینا؛ گوڵەمەمێشە؛ گوراڵەچەرمە ☱ گُل مینا

**گوڵواخن** / gułwaxin/: ☜ **گوڵبێن‌ناخن**

**گوڵـواز** / gułwaz/: ناو. گلواز؛ ڕسـتەهەنجیری بـە ئاڵقە ☱ حلقه انجیر به رشته کشیده

**گوڵـوس** / gułus/: نـاو. ئاخـــەلێوە؛ خاکـــەلێوە ☱ سرآغاز بهار

**گوڵوڵ** / gułwil/: ناو. جـۆرێ گوڵـەباخی ڕەنگـی ئاڵی مەیلەو زەرد ☱ گل رُز

**گوڵوە** / gułwe/: ☜ **گوڵبێتە**

**گوڵوەدەم** / gułwedem/: ☜ **گوڵبەدەم**

**گوڵوێنـک** / gułwênik/: نـاو. ئاڵـــقەپەتی ملـــی

ڕەشەولاخ ▬ رسن گردن گاو

**گوڵوێنە / gułwêne**/: ☜ **گوڵبێتە**

**گوڵۆ / gulo**/: ناو. ١. ☜ **گوڵبێتە** ٢. کونەبا لە شاخدا ▬ ١. ☜ **گولبیته** ٢. منفذ باد در کوه

**گوڵۆپ / gułop**/: ناو. گڵۆپ؛ چرای کارەبا ▬ لامپ برق

**گوڵۆپە / gułope**/: ناو. گڕپە؛ کڵپە ▬ زبانەی آتش

**گوڵۆف / gułof**/: ☜ **گڵۆف**

**گوڵۆفتن / gułoftin**/: ☜ **گڵۆفین**

**گوڵۆفتین / gułoftîn**/: ☜ **گڵۆفین**

**گوڵۆفین / gułofîn**/: ☜ **گڵۆفین**

**گوڵۆڵک / gułołik**/: ☜ **گڵۆڵە**[1]

**گوڵۆڵە / gułołe**/: ☜ **گڵۆڵە**

**گوڵۆڵەپێچ / gułołepêç**/: ناو. چۆڵەپێچ؛ تەنافپێچ ▬ طناب‌پیچ

**گوڵۆڵە و گردەنشین / gułołe w girden(i)şîn**/: ناوەڵناو. یەککەوتە؛ گیرۆدە و داکەوتە ▬ خانەنشین

**گوڵۆنە / gułone**/: ☜ **گوڵبێتە**

**گوڵووک / gułûk**/: ناو. شکۆفە؛ گوڵی درەخت ▬ شکوفەی درخت

**گوڵووکەفەقیانە / gułûkefeq(i)yane**/: ناو. ڕێحانە کێویلە ▬ ریحان کوهی

**گوڵە- / gułe-**/: پێشوشە. ١. گچکە؛ بووچک ‹گوڵەجێ› ٢. هێشوو؛ هۆشە ‹گوڵەگەنم؛ گوڵەجۆ› ▬ ١. کوچک ٢. خوشه

**گوڵەئاخ / gułe'ax**/: ☜ **گوڵەئاوات**

**گوڵەئاران / gułe'aran**/: ناو. مامیران؛ مامیلان؛ پەنجەداڵ ▬ ماميران

**گوڵەئاسۆ / gułe'aso**/: ناو. گوڵەستێرە؛ گیایەکی ڕازێنەیی بە گوڵی زل و زەردی وەک خۆرەوە ▬ گُل ستاره‌ای

**گوڵەئاگری / gułe'ag(i)rî**/: ناو. گوڵە ئەرخەوانی؛ بنەگیایەکی ئاڵفی بە گەڵای نەرم و گوڵی گەورەی سوورتۆخەوە ▬ گُل آتشی

**گوڵەئالۆز / gułe'ałoz**/: ناو. زوانەبووکە؛ گیایەکە لە تیرەی هەڵالان، بە هێشووی پێچەڵپێچی درێژ و بنەوش، سوور یان سپی ▬ زبان‌درقفا

**گوڵەئاوات / gułe'awat**/: ناو. گوڵە ئاخ؛ زارەگا؛ گیا بالووکە؛ گوڵە شفا؛ مەخەلەسە؛ گیاێکی ڕازێنەری بە گوڵی سوور، ئاڵ یان سپییەوە ▬ گُل میمون

**گوڵەئاوەنیا / gułe'awenya**/: ناو. گوڵەجووتیار؛ گوڵەجووتێرە؛ گوڵەعەزرەتی؛ گوڵەخەیارک ▬ سورنجان

**گوڵەئەرغوو / gułe'erğû**/: ناو. ئەرغوو؛ ئەرغەوان ▬ ارغوان

**گوڵەئەسپەک / gułe'espek**/: ☜ **گوڵەدیاری**

**گوڵەئەستەمبوڵی / gułe'estembułî**/: ناو. کەوکەو؛ گولا شێستپەڕ؛ گوڵێکی پڕپەلکە بە زۆر ڕەنگان ▬ گُل کوکب

**گوڵەئەستێرە / gułe'estêre**/: ناو. خاڵخاڵۆکە؛ گیئاسارە ▬ کرم شب‌تاب

**گوڵەئەشکەوت / gułe'eşkewt**/: ناو. شەنگاڵ؛ شەنگار؛ کاهووەکەرانە ▬ شنگار

**گوڵەئەوین / gułe'ewîn**/: ناو. خەڵاتە گیا؛ جۆرێ گوڵی سپی یان ئاوی کاڵە کە وەک هێشوو بەڵام لە ڕزنێکدا دەپشکوێ ▬ گُل فراموشم‌مکن

**گوڵەئێش / gułe'êş**/: ناو. دەرمانەئازار؛ گوڵەدەوری ▬ عاقرقرحا

**گوڵەبابوونە / gułebabûne**/: ☜ **گوڵەبەیبوون**

**گوڵەباخ / gułebax**/: ناو. گولاسۆر؛ گوڵەباغ؛ گوڵ؛ گوڵگولاو؛ گوڵی گولاو؛ گوڵباخی؛ سوورگوڵ؛ سۆرگوڵ؛ ئەو گوڵە لاسک بە دڕکەی گولاوی لێ دەگیرێ ▬ گُل محمدی

**گوڵەباغ / gułebağ**/: ☜ **گوڵەباخ**

**گوڵەبرێژ** / gułeb(i)rêj/: ناو. کەبابی بەرگ ≡ کباب برگ

**گوڵەبوک** / gułebûk/: ناو. لالە؛ گوڵەمێلاقە ≡ لاله

**گوڵەبەبەشە** / gułebebeşe/: ناو. گوڵێکی دەشتەکی ≡ گُلی صحرایی

**گوڵەبەرامە** / gułeberame/: ناو. نەسرین؛ ولەگولاوی ≡ نسرین

**گوڵەبەرزانی** / gułeberzanî/: ناو. گوێنۆ؛ گیایەکی بالابەرزە گوڵی زەرد دەر دەکا و لە نێو مێرگ و قۆپیدا شین دەبێ ≡ گیاهی است

**گوڵەبەرۆژە** / gułebeřoje/: ناو. گولابەربەرۆژکێ؛ گۆگباخان؛ گوڵبەڕۆژ؛ ڕۆژامپەرێز؛ ڕۆژانپەرێز؛ بەرووژە؛ ڕۆجیاپەرشت؛ ڕۆجیارپرێس؛ ڕۆژیارپەرس؛ هەتاوپەرس؛ گوڵ بەرەفتاو؛ گولوەردەخوەر؛ ڕووەکێکی لاسک بەرز و گەلا پانە و تا تۆمی نەکردووە گوڵەکەی دەگەڵ خۆر دەگەڕێ ≡ آفتابگردان

**گوڵەبەرۆنە** / gułebeřone/: ☜ **گوڵهەنگ**

**گوڵەبەنۆشەک** / gułebenoşek/: ناو. فاتمەداروو؛ هەنگەبەر ≡ فرنجمشک

**گوڵەبەوی** / gułebewî/: ناو. خاشخاش؛ گولالە؛ گورالە؛ هەلالە ≡ شقایق

**گوڵەبەیبون** / gułebeybûn/: ناو. گولاچاوێشە؛ گولەبابوونە؛ گولەبەیبوونە؛ گولەچاوێشە؛ گولەچەرمەلە؛ گولەچەمئێشە؛ گورالەکەچەلێ؛ گولەچەرمگە؛ گورالەچەرمێ؛ گوڵتووتک؛ گولەحاجیانە؛ گولەحاجیلە؛ گورالەحاجیانە؛ گولەفەقیانە؛ گوڵی بۆنخۆشی سپی یان زەردی گیای بەیبوون کە بۆ دەرمان دەشێ ≡ گُل بابونه

**گوڵەبەیبونە** / gułebeybûne/: ☜ **گوڵەبەیبون**

**گوڵەپاییزە** / gułepayîze/: ناو. گولا پاییزێ؛ گوڵێکە لە پاییزدا دەپشکوێ ≡ سورنجان؛ گُل حسرت

**گوڵەپرووزە** / gułep(i)řûze/: ناو. قەرەخەرمان ≡ غلەی دلمل بوداده

**گوڵەپژمین** / gułepijmîn/: ناو. گیایەکە بۆنی توندە ≡ گیاهی است

**گوڵەپوران** / gułepûran/: ناو. مەریەم؛ مریەم؛ پەلەوشە ≡ مریم

**گوڵەپیالە** / gułep(i)yałe/: ناو. گوڵەزەنگ؛ ڕۆنیاسە گیا؛ بنەگیایەکی پایایە بە گوڵی جوان و هەمەڕەنگەوە، هاوینان دەپشکوێ ≡ گُل استکانی

**گوڵەپێفەمبەرە** / gułepêğembere/: ☜ **گەنمەشامی**

**گوڵەتۆپلاخە** / gułtopłaxe/: ناو. گوڵی پێوەنی؛ جۆرێ گوڵی سووری پڕ گەلا و جوانە ≡ گُل صدبرگ

**گوڵەتیکە** / gułetîke/: ناو. شەسپەڕەفەرەنگی؛ گولەدەقاق ≡ آهار

**گوڵەجاف** / gułecaf/: ☜ **گوڵەجەفاکێش**

**گوڵەجۆ** / gułeco/: ناو. جێدەنک لە جۆدا ≡ خوشەی جو

**گوڵەجوتیار** / gułecûtyar/: ☜ **گوڵەناوەنیا**

**گوڵەجوتیارە** / gułecûtyare/: ناو. گوڵێکە سەرەتای پاییز پەیدا دەبێ ≡ گلی صحرایی کە اوایل پاییز می‌شکفد

**گوڵەجوتێرە** / gułecûtêre/: ☜ **گوڵەناوەنیا**

**گوڵەجەفاکێش** / gułecefakêş/: ناو. گولەجاف؛ ڕووسکە؛ گوڵێکە بۆ ئازارەباریکە بە کەڵکە ≡ گل خیار؛ گل کارگر

**گوڵەجێ** / gułecê/: ناو. جێگایەکی چکۆلەی لەبەرچاو ≡ گُلەجا

**گوڵەچاوئێشە** / gułeçaw'êşe/: ☜ **گوڵەبەیبون**

**گوڵەچاوپشیلە** / gułeçawp(i)şîle/: ناو. گوڵێکی زەردە وەک نێرگز ≡ گلی شبیه نرگس

**گوڵەچاوێشە** / gułeçawêşe/: ☜ **گوڵەبەیبون**

**گوڵەچەرمەڵە** / gułeçermełe/: ☜ **گوڵەبەیبون**
**گوڵەچەمئێشە** / gułeçem'êşe/: ☜ **گوڵەبەیبون**
**گوڵەچیا** / gułeç(i)ya/: ناو. نەسرین؛ گوڵـەبەرامە ▤ نسرین
**گوڵەحاجیانە** / gułeĥac(i)yane/: ☜ **گوڵەبەیبون**
**گوڵەحاجیلە** / gułeĥacîle/: ☜ **گوڵەبەیبون**
**گوڵەخەندران** / gułexend(i)ran/: ناو. خاشـخاش؛ گولالە؛ هەلالە؛ گولالەسوورە ▤ شقایق
**گوڵەخەنە** / gułexene/: ناو. گیایەکـە ▤ گیـاهی است
**گوڵەخەیارک** / gułexeyarik/: ☜ **گوڵەناوەنیا**
**گوڵەداس** / gułedas/: نـاو. جـۆرێ نەخۆشـییە لـە زمانی ڕەشەولاغ دێ ▤ نوعی بیماری زبان گاو
**گوڵەداماگ** / gułedamag/: نـاو. مەریـەم؛ مریـەم؛ پەلەوشە ▤ مریم
**گوڵـەداودی** / gułedaw(i)dî/: نـاو. گوڵـــەداویتی؛ داودی؛ گوڵەزووفا ▤ گل داودی
**گوڵەداویتی** / gułedawîtî/: ☜ **گوڵەداودی**
**گوڵەدۆمـە** / głedome/: نـاو. گوڵـــێکی زەردی درشتی دەشتە ▤ گُلی زرد و درشت صحرایی
**گوڵەدووپشکە** / głedûpişke/: ناو. نـاوی گوڵـێکە ▤ گلی است
**گوڵەدەقاق** / głedeqaq/: ☜ **گوڵەتیکە**
**گوڵـەدەوری** / głedewrî/: نـــاو. دەرمانـــــەئازار؛ ڕەگەڕووتە؛ گوڵەئێش ▤ عاقرقرحا
**گوڵـەدیاری** / głed(i)yarî/: نـاو. گوڵەئەسـپەک؛ شالانگ؛ گوڵ دیاری؛ گوڵە خەنجەری؛ چەمقالاو؛ گەلایۆل؛ گوڵێکی جوانی هەمەڕەنگی گـەلاپان و لق هەلکشاوە، لە سەر هەر لقێکی ڕیزێک گوڵـی شەیپوورئاسا دەپشکوێن ▤ گلایول
**گوڵەڕۆنینە** / głeřonîne/: ☜ **گوڵهەنگ**
**گوڵـەڕووتـە** / głeřûte/: نـاو. گوڵـڕووت؛ جـۆرێ تۆمی گەنم ▤ نوعی گندم

**گوڵەزۆفا** / głezofa/: ☜ **گوڵەزووفا**
**گوڵـەزووفـا** / głezûfa/: نـاو. گوڵـــەزۆفا؛ داودی؛ داویتی؛ گوڵەداودی ▤ گل داودی
**گوڵەزەردە** / głezerde/: ناو. گـولا زەر: ١. گوڵـە زەرد؛ گوڵە ول؛ ولـەزەرد؛ دارچکێکـی لـق و پـۆ کـەوانی دڕکاوییـە، گوڵـێکی زەردی بۆنخـۆش دەکا، مرەبا و هەڵـوای لـێ دروسـت دەکـەن ٢. زەردەسـیری؛ دڕووە زەردە ▤ ١. گُـل زرد ٢. تیـغ کوهی که نوعی خار است
**گوڵەزەنگ** / głezeng/: ☜ **گوڵەپیاڵە**
**گوڵەژەن** / głejen/: نـاو. ئـەو کەرسـتە گلۆڵـەی خەڕەکی لە سەر هەڵدەکرێ ▤ ابزاری در بافندگی که نخ بر آن پیچند
**گوڵەسار** / głesar/: ☜ **گوێرەوسار**
**گوڵەستێرە** / głestêre/: نـاو. گـوڵ ئەسـتێرە: ١. گیئاسارە؛ گوهسـارە؛ گـویئاسـارە؛ ئەسـتێرۆک؛ گوئەستێرە ٢. ☜ **گوڵەناسۆ** ▤ ١. کرم شبتاب ٢. ☜ **گوڵەناسۆ**
**گوڵەسۆ** / głeso/: ☜ **گوڵپەڕ ـ٣**
**گوڵـەسـورکە** / głesûrke/: نـاو. ڕێحانەکێویلـــە؛ گیایەکە گەلای لە ڕێحانە دەچێ لە دێم و بـوورە شین دەبێ ▤ ریحان کوهی
**گوڵـەسـەر** / głeser/: نـاو. بـادارۆک؛ دەسـریلەی سەری منالی ساوا ▤ دستمال سر نوزاد
**گوڵەسەگانە** / głesegane/: نـاو. شیلانەدەشـتی ▤ نسترن
**گوڵەســێو** / głesêw/: نــــاو. ســـــــێبنەرد؛ سێوەبنعەرزیلە ▤ سیبزمینی استانبولی
**گوڵەشلێرە** / głeşillêre/: نـاو. شـلێرە ▤ لالـەی سرنگون
**گوڵەشلێرە** / głeş(i)lêre/: نـاو. ســەرنەخوونک؛ هەلالەبرمە ▤ لالەی سرنگون
**گوڵەشەراوی** / głeşerawî/: ناو. گوڵـی سـاعەتی؛

شیرین‌توو؛ بنەگیایەکی پێچی گەڵا پان و بڵاوە بە گوڵی درشت و پانکەڵەی سوور یان ئەرخەوانی بریقەدارەوە 🇮🇷 گُل ساعتی

**گوڵەشەمالی** / gułeşemalî/: ناو. شەمدانی؛ شەمانی؛ گوڵەشەمالیە 🇮🇷 گُل شمعدانی

**گوڵەشەمالیە** / gułeşemal(i)ye/: ☜ **گوڵەشەمالی**

**گوڵەشیلان** / gułeşîlan/: ناو. نەستەرەن؛ شیلان؛ دلێق؛ ولەتووت 🇮🇷 نسترن

**گوڵەعەزرەتی** / gułe'ezretî/: ☜ **گوڵەناوەنیا**

**گوڵەفەقە** / gułefeqe/: ☜ **گوڵەگورگە**

**گوڵەفەقیانە** / gułefeq(i)yane/: ☜ **گوڵەبەیبون**

**گوڵەفەقێ** / gułefeqê/: ناو. گوڵێکی دەشتە 🇮🇷 گلی صحرایی

**گوڵەقەدیفە** / gułeqedîfe/: ناو. کاکنج؛ بزگیلە؛ گەزۆکە؛ تەماتەجنانێ 🇮🇷 کاکنج

**گوڵەک** / gułek/: ناو. گوڵجار؛ گوڵزار؛ چیمەنی پڕگوڵ 🇮🇷 گُلزار

**گوڵەکابە** / gułekabe/: ☜ **گەنمەشامی**

**گوڵەکاردۆ** / gułekardo/: ناو. خازی؛ خاز؛ گوڵخاز؛ گوڵەهاز؛ گوڵێکە لە شەیپوور دەکا و بۆ سۆمای چاو یا لابردنی زەرداو بەکەڵکە 🇮🇷 گُل شیپوری

**گوڵەکاغەزی** / gułekağezî/: ناو. دارچکێکی جوانی گەرمەسێرە بە لقی داهاتوو، گەڵای کەسک و گوڵی پچووکی سێ‌پەڕی سپی، ئەرخەوانی، سوور یان نارنجییەوە 🇮🇷 گُل کاغذی

**گوڵەکە** / gułeke/: ☜ **گوێرەکە**

**گوڵەکەتان** / gułeketan/: ناو. هەمیشەگوڵ؛ هەمیشەجوان؛ هەمیشەبەهار؛ جوانەگوڵ؛ ناوی چەن جۆر گوڵەمەیموون بە لقی نەرم و داشۆڕاو و گوڵی بنەوشەوە 🇮🇷 گُل کتانی

**گوڵەکەلەرم** / gułekelerm/: ناو. گوڵەکەلەم؛ جۆرێک کەلەرمە گوڵەکەی زۆر گەورە دەبێ و لە ترشی دەکەن 🇮🇷 گُل کلم

**گوڵەکەلەم** / gułekelem/: ☜ **گوڵەکەلەرم**

**گوڵەگرێ** / gułeg(i)řê/: ناو. ئاردەتوو 🇮🇷 آرد توت

**گوڵەگورگە** / gułegurge/: ناو. گوڵەفەقە؛ گوڵێکی سوورە پاییزان شین دەبێ 🇮🇷 گلی پاییزی به رنگ قرمز

**گوڵەگەزیزە** / gułegezîze/: ☜ **گەزیزە**

**گوڵەگەنم** / gułegenim/: ناو. ١. جێگەی دان لە سەر لاسکی گەنم ٢. ☜ **گەنمەشامی** 🇮🇷 ١. خوشەی گندم ٢. ☜ **گەنمەشامی**

**گوڵەما** / gułema/: ناو. هەوێنی پەنیر 🇮🇷 مایەی پنیر

**گوڵەمارانێ** / gułemaranê/: ناو. بۆژانە؛ بووژانە 🇮🇷 بومادران

**گوڵەماساوە** / gułemasawe/: ناو. گوڵێکی زەردی بۆن‌گرانە 🇮🇷 گلی زرد و بدبو

**گوڵەمۆڵە** / gułemołe/: ناو. خاشخاش؛ گوڵالە؛ گوراڵە؛ هەلالە؛ گوڵالەسوورە 🇮🇷 شقایق

**گوڵەمە** / gułeme/: ناو. مست؛ مشت 🇮🇷 مُشت

**گوڵەمەخموور** / gułemexmûr/: ☜ **گوڵمەخموور**

**گوڵەمەخمەر** / gułemexmer/: ناو. گوڵێکی گەڵا بنەوشە لە گوڵداندا پەروەردە دەکرێ 🇮🇷 گلی است

**گوڵەمەمێشە** / gułememêşe/: ☜ **گوڵەمینا**

**گوڵەمینا** / gułemîna/: ناو. مینا؛ گوڵەمینا؛ گوڵ‌نیشان؛ گوڵەمەمێشە 🇮🇷 گُل مینا

**گوڵەمێلاقە** / gułemêlaqe/: ناو. باتینۆک؛ بووکوزاوا؛ خورمەچیچان؛ ڕەبەنۆک؛ گۆنگیلۆک؛ لالە؛ نیسان 🇮🇷 لاله

**گوڵەنار** / gułenar/: ناو. گوڵنار؛ گیایەکی دەشتەکییە گوڵی سووری وەک گوڵی هەنار دەکا 🇮🇷 گُلنار

**گوڵەنارنج** / gułenarinc/: ناو. بەهارنارنج؛ پشکوەنارنج 🇮🇷 بهارنارنج

**گوڵەندام** / gułendam/: ئاوەڵناو. خـاوەن بـاڵای ڕێک و جوان ☰ گُل‌اندام

**گوڵـەنگ** / gułeng/: نـاو. گورینـــگ؛ گوڵـــنگ؛ گوڵـەنگە؛ گوڵـینگ: ١. پـرزەی لێـکـهـاڵاوی بەسـتراوی سـەرقرتاو، بـۆ جـوانی ٢. پـرزەی سروشتی و خۆڕسکی ژێر ملی برێ ماڵات (وەک: پەز و بزن) ٣. قیتکەی ناو زێی ماییـن، کە دەیبڕن ☰ ١. منگوله ٢. منگوله‌ی مادرزادی بعضی احشـام ٣. چوچوله‌ی مادیان

◻ **گوڵـەنگ بـڕین**: ١. قیتکە بڕینی زێـی مـاین ٢. [کینایە] هەڵخڵـەتاندن و دەسـت بـڕین ☰ ١. بریدن چوچوله‌ی مادیان ٢. فریب دادن

**گوڵەنگە** / gułenge/: ☜ **گوڵەنگ**

**گوڵەنـەورۆزە** / gułenewroze/: نـاو. نـــەورۆزە؛ گوڵـەنەورۆزی؛ کـولبزک؛ گیایـەکی گەڵانـەرم و ئەستوورە کە هێشووەگوڵی لە سەرەتای بـەهاردا لە سەر لاسکەوە دەردێ ☰ گُل نوروز

**گوڵەنەورۆزی** / gułenewrozî/: ☜ **گوڵەنەورۆزە**

**گوڵەنیسان** / gułenîsan/: ناو. لالە؛ گوڵەمێلاقە ☰ لاله

**گوڵـەواژ** / gułewaj/: ناو. گیایەکە لە دار و بـەرزی دەهاڵێ ☰ نوعی پیچک

**گوڵەوەچینی** / gułeweçînî/: ناو. کاری گوڵەدەخل چنینەوە ☰ خوشه‌چینی

**گوڵـەوەر** / gułewer/: نـاو. کـرێژ؛ قرێژەبـەرد ☰ گُلسنگ

**گوڵەهـاز** / gułehaz/: ناو. خـازی؛ خـاز؛ گوڵـخاز؛ گوڵەکاردۆ ☰ گل شیپوری

**گوڵەهـەسێڵ** / gułehesêł/: ناو. بۆژانـە؛ بـۆژان ☰ بومادران

**گوڵەهەنگوین** / gułeheng(i)wîn/: ناو. زەردەزەردە؛ گیای سەفرابەر کە بۆ لابردنی زەرداو بەکەڵـکە ☰ شاهسپرم کوهی

**گوڵـەهێرۆ** / gułehêro/: نـاو. گوڵـێکی درشـتی جوانە بە زۆر ڕەنگان دەبێ و بۆ دەرمان دەشێ ☰ گُل ختمی

**گـوڵهرج** / gułhirç/: نـاو. گوڵـێکی وەنەوشـی گەڵاپانە خاڵی سپی دەناودایە ☰ گلی بنفش رنگ

**گوڵهەڵگرەوە** / gułhełg(i)rewe/: ناو. خۆشەچین؛ هێشووگەر؛ هێشووکەر ☰ خوشه‌چین

**گوڵهەن** / gułhen/: ☜ **گوڵهەنگ**

**گوڵهەنگ** / gułheng/: ناو. گوڵ هەن؛ گـوڵ تـۆپ؛ گولەبەڕۆنە؛ گولەڕۆنینە ☰ افسنتین

**گوڵهەورێشم** / gułehewrêşim/: ناو. شەوگەشـە؛ پاقلەمارانە ☰ شب‌خُسب

**گوڵی** / gułî/: ناو. پەمبـەیی؛ چێرەیـی ☰ صـورتی رنگ

**گوڵی‌پۆ** / gułîpo/: ☜ **گوڵمەخمور**

**گوڵینگ** / gułîng/: ☜ **گوڵەنگ**

**گوڵێڵـە** / gułêłe/: نـاو. واریپـــاڵ؛ وەنەوشـــەی دەشتەکی ☰ بنفشه‌ی کوهی

**گوڵێنە** / gułêne/: ☜ **گوڵێتە**

**گوڵێنەئاخن** / gułêne'axin/: ☜ **گوڵێن‌ئاخن**

**گوم**[١] / gum/: ناو. گاف؛ گاو؛ هەنگاو ☰ گام

**گوم**[٢]: ئاوەڵناو. گم؛ بزر؛ نادیار ☰ گُم

◻ **گوم بوون**: بزر بوون ☰ گُم شدن

**گوم کردن**: نادیار کردن ☰ گُم کردن

**گوم**[٣]: ☜ **گومەگوم**

**گومـان** / guman/: نـاو. ١. گۆمـــان؛ دوودڵـــی؛ دڕدۆنگی؛ شک؛ سۆ ‹چۆن دەتوانم بە تۆ بڵـێم مـن چیم/ خۆم گومانـم هەیە کە هەم یا نـیم «هـێمن»› ٢. کارێز؛ کەرێز ☰ ١. گمان ٢. قنات

◻ **گومـان بـردن**: ١. شک کردن ٢. شک بردن؛ لـە لا بوون ‹هیچ شـتێ گومـان نابـەم› ☰ ١. شـک کردن ٢. سُراغ داشتن

**گومانبـار** / gumanbar/: نـاو. جێگـەی گومـان ☰

مُتهم

**گومان‌ڕەش** / gumanřeş/: ناوەڵناو. بیرخراو؛ بێ‌فەڕ و دڵ‌پیس ⚑ بداندیش

**گومانن** / gumanin/: ☜ **گماندن**

**گومانە** / gumane/: ناو. گەمانە: ١. ئاخر چاڵاو لە کارێزدا ٢. چاڵاوی لێدراو بۆ تاقی کردنەوە ⚑ ١. آخرین چاه کهریز ٢. گُمانه؛ چاه آزمایشی

**گومایش** / gumayiş/: دەنگەناو. گرمەی زەحف ⚑ صدای مهیب

**گومایش** / gumayîş/: چاوگ. زرینگانەوەی گوێ ⚑ وز ـ وز کردن گوش

**گومبو** / gumbû/: ناوەڵناو. ون‌بوو؛ بێ‌سەروشوێن ⚑ گُم؛ بی‌نشان

**گومبەت** / gumbet/: ☜ **گومەز**

**گومبەتە** / gumbete/: ناو. کاری خۆ بۆ فڕێ دان ‹گومبەتەی لە خۆی دا و بۆی چوو› ⚑ جهش؛ پرش

**گومبەد** / gumbed/: ☜ **گومەز**

**گومبەز** / gumbez/: ☜ **گومەز**

**گومتل** / gumtil/: ناو. کلۆی چکۆلە ‹گومتلێ قەندم بەرێ!› ⚑ کلوخک

**گومتیل** / gumtîl/: ناو. ١. پەنامی لەشی مرۆ ٢. لوو؛ زەقایی و ڕەقایی لە پێست ⚑ ١. ورم؛ آماس ٢. غُده

**گومرک** / gumrik/: ناو. گوومرگ؛ مەزرینگەی چاودێری لە هاتوچۆی کەل‌وپەل (هاوردە و هەناردە) و گرتنی مافی ئەو هاوردن و بردنە لە خاوەنەکانیان ⚑ گُمرک

**گومڕا** / gumřa/: ناوەڵناو. گومڕە؛ لاڕێ؛ هەتلە؛ هەلە: ١. ڕێ‌لێ‌ون‌بوو ‹خوا حەز بکا، هەر کەسێ گومڕا دەکات و حەزیش بکا، شارەزای بەرەو خۆی دەکا «هەژار، *قورئان*»› ٢. *[کینایە]* لە دام و دەستوور لاداو ٣. *[کینایە]* دەوڵەمەندی لەخۆبایی ⚑ ١و٢. گُمراه ٣. ثروتمند غرّه

**گومرچە** / gumirçe/: ناو. گۆمرچە؛ مشتەکۆڵە؛ سوخورمە ⚑ سُقُلمه

**گومڕە** / gumře/: ناوەڵناو. ١. ☜ **گومڕا** ٢. زۆر سەخت و بەزەحمەت ⚑ ١. ☜ **گومڕا** ٢. دشوار

**گومز** / gumiz/: ☜ **گومەز**

**گومساندن** / gumsandin/: چاوگ. شێلان (قوڕ، هەویر و ...) ⚑ سرشتن (گل، خمیر و ...)

**گومش** / gumş/: ناو. ١. ☜ **گوێلە ـ٢** ٢. مشتی وەکری ٣. ☜ **گۆیژ** ⚑ ١. ☜ **گوێلەـ٢** ٢. مُشت بازشده ٣. ☜ **گۆیژ**

**گومک** / gumik/: ناو. گوومک؛ بەندی سەرووی قامک ⚑ بند انتهایی انگشت

**گومگ** / gumig/: ☜ **گومەز**

**گومگمۆک** / gumg(i)mok/: ☜ **گومگومۆک**

**گومگمۆکە** / gumg(i)moke/: ناو. ١. تۆنگەی بچووک ٢. مەتارەی سەفەر ⚑ ١. تُنگ کوچک ٢. قُمقُمەی سفری

**گومگوم**[1] / gumgum/: ناو. قومقومە؛ قمقمۆکەی ئاو ⚑ قُمقُمەی آب

**گومگوم**[2]: دەنگەناو. ١. دەنگی ڕۆیشتنی ئاو ٢. وزەی زۆری مێش ⚑ ١. صدای جریان آب ٢. وز ـ وز زیاد مگس

**گومگومک** / gumgumik/: ☜ **گومگومۆک**

**گومگومۆک** / gumgumok/: ناو. گومگومک؛ گومگمۆک؛ خەمەگرۆ؛ فات‌فاتک ⚑ مارمولک

**گومگومە** / gumgume/: ناو. ١. تۆنگە؛ تۆنگ ٢. مەتارە؛ ئافدەف ٣. فنجانی قاوە ⚑ ١. پارچ ٢. قُمقُمه ٣. فنجان قهوه

**گومگومین** / gumgumîn/: چاوگ. ١. گرماندنی هەور ٢. نەڕاندن؛ گوڕە کردن ⚑ ١. غُریدن رعد ٢. غُریدن آدمی

**گومگە** / gumge/: ناو. جێگەی گوم بوون ⚑ محل گُم شدن

**گوملک / gumlik/**: ناو. گجی؛ کراس ≡ پیراهن

**گوممبەت / gummbet/**: ☜ گومەز

**گومناو / gumnaw/**: ئاوەڵناو. بێ‌ناو و نیشان؛ نەناسراو ≡ گُمنام

**گومنی / gumnî/**: ناو. زایەڵە؛ پێژن؛ ڕەوتی دەنگ دانەوە ≡ انعکاس صوت؛ پژواک صدا

**گوموگۆڕ / gum û goř/**: ئاوەڵناو. *[پەلار]* بزربوو؛ شرت‌وگوم ≡ گم‌وگور

**گومە¹ / gume/**: ☜ گومەز

**گومە²**: ☜ گومەگوم

**گومەتە / gumete/**: ناو. ١. قنە؛ قونە؛ شێوەی بەڕێوەچوونی کەو و کۆتر ٢. ☜ گومەڵەك ٣. ☜ گومەز ≡ ١. خرام کبک و کبوتر ٢. ☜ گومەڵەك ٣. ☜ گومەز

**گومەد / gumed/**: ☜ گومەز

**گومەز / gumez/**: ناو. گومبەت؛ گومبەز؛ گومز؛ گومە؛ گومەد؛ گومەزی؛ گونبەز؛ گونبەت؛ گوممبەت؛ گومبەد؛ گومگ؛ گۆمەزە؛ قوبە؛ قوبە؛ کل؛ میچی نێوتۆپ ≡ گُنبد

**گومەزە / gumeze/**: ناو. ١. ☜ گومەڵەك ٢. بلقی سەر ئاو ٣. هەر شتی پشت‌زەق وەک گومبەز ≡ ١. ☜ گومەڵەك ٢. حُباب آب ٣. گُنبدی شکل

**گومەزی / gumezî/**: ☜ گومەز

**گومەسار / gumesar/**: ئاوەڵناو. *[پەلار]* نوقمەسار؛ بێ سەروشوێن ‹زۆرێ لاسار هاتن و چوون و لە مێژوودا گومەسار بوون› ≡ مفقودالاثر

**گومەگوم / gumegum/**: دەنگەناو. گم؛ گوم؛ گمە؛ گمەگم؛ گومە؛ دەنگی کۆتر ≡ صدای کبوتر

**گومەڵ / gumeł/**: ناو. گولم؛ پڕی مست ≡ پُر یک مُشت

**گومەڵتە / gumełte/**: ئاوەڵناو. کۆما؛ کۆگاکراو ≡ انباشته؛ تلنبار

**گومەڵەک / gumełek/**: ناو. گومەتە؛ گومەزە؛ باز بردنی کەروێشک و ئاسک و بزنەکێوی ≡ جهش و پرش (حیوانات)

**گومەیل / gumeyl/**: ناو. کفتە ≡ کوفتە

**گومی / gumî/**: ناو. ١. ونی؛ وندابوویی؛ نادیاری ٢. ڕەوتی زرینگانەوەی گوێ ≡ ١. گُمی؛ ناپیدایی ٢. وز ــ وز گوش

**گومین / gumîn/**: چاوگ. ١. ☜ گرماندن ٢. خوێندنی کۆتر ٣. خلۆر بوونەوە ≡ ١. ☜ گرماندن ٢. آواز خواندن کبوتر ٣. غلتیدن

**گون / gun/**: ناو. ١. *[شوورەیی]* هێلکەگون؛ باتوو ٢. *[شوورەیی]* کێر؛ کیر ٣. ☜ گوند ≡ ١. خایە ٢. کیر ٣. ☜ گوند

▣ **گون سەگاوی**: گونی سەگلاو کە بۆ دەرمان دەشێ ≡ جند بیدستر

**گون شەیتان**: بەردێکی خەیالییە دەیانگوت مس دەکاتە زێڕ ≡ اکسیر؛ سنگ فیلسوفان؛ اکسیر اعظم

⊡ **گون بە کەسێک نیشان دان**: *[کینایە، شوورەیی]* ڕەد کردنی داخوازی کەسێک ≡ درخواست کسی را رد کردن

**گون پێنەبزوان**: *[کینایە، شوورەیی]* گوێ پێ نەدان و بە هیچ نەزانین ≡ اهمیت ندادن و بە حساب نیاوردن

**گون تەقاندن**: *[کینایە، شوورەیی]* کار نەکردن و خۆ خلافاندن ≡ دل بە کار ندادن

**گون دەرهێنان/ دەرهاوردن**: خەساندن ≡ اختە کردن

**گون گرتن**: *[کینایە، شوورەیی]* گونک گرتن؛ هیچ پێ نەکران ‹خۆ من خەریکم لە برسا دەمرم/ لەباتی کەروێشک مەر گونت بگرم! «قانع»› ≡ کاری از دست بر نیامدن

**گونا / guna/**: ☜ گوناه

**گونابار / gunabar/**: ☜ گوناهبار

**گوناته** / gunate/: ئاوەڵناو. شووم؛ بەدفەڕ؛ جووت قۆشە ☰ نحس؛ شوم

**گوناح** / gunaĥ/: ☜ گوناه

**گوناحبار** / gunaĥbar/: ☜ گوناهبار

**گوناحکار** / gunaĥkar/: ☜ گوناهبار

**گوناد** / gunad/: ☜ گوناه

**گوناسا** / gunasa/: ☜ گوناه

**گوناسە** / gunase/: ☜ گوناه

**گوناکار** / gunakar/: ☜ گوناهبار

**گونان** / gunan/: ☜ گورن

**گوناه** / gunah/: ناو. گونا؛ گوناح؛ گوناسا؛ گوناسە؛ گونەه؛ گوناد: ١. کاری ناڕەوا لە چاو دین، قانوون یان لە ئاست خەڵکەوە ٢. *[مەجاز]* بێچارە ‹کابرایەکی گوناه و بێچارە بوو› ☰ ١و٢. گُناه

⊡ **گوناه بوون**: ١. ناڕەوا و نەشیاو بوون لە چاو دین و دابەوە ٢. بەر بەزەیی بوون ‹ئەو مندالانە زۆر گوناهن، برسییانە› ☰ ١و٢. گُناه داشتن

**گوناهبار** / gunahbar/: ئاوەڵناو. گونابار؛ گوناحبار؛ گوناحکار؛ گونادبار؛ گوناکار؛ گوناهکار؛ گونەهبار؛ گونەهکار؛ تاوانبار؛ تاواندار؛ سووچدار؛ هەڵەبار؛ خاوەن کردەوەی دژ بە دین یان قانوون ☰ گُناهکار

**گوناهکار** / gunahkar/: ☜ گوناهبار

**گونایيش** / gunayîş/: چاوگ. وێککەوتن؛ لەش وە لەش کەوتن؛ لێکەوتن ☰ به هم برخورد کردن

**گونبەت** / gunbet/: ☜ گومەز

**گونبەز** / gunbez/: ☜ گومەز

**گونپسیک** / gunp(i)sîk/: ناو. گیایەکە بەرەکەی لە گونی پشیلە دەکا ☰ گیاهی است

**گونپەنەماو** / gunpenemaw/: ئاوەڵناو. *[شووروەیی]* ڕتلۆ؛ گونهەڵمساو؛ گونشۆڕ؛ باتوو باکردوو ☰ فتقی

**گونپەنەماوی** / gunpenemawî/: ناو. *[شووروەیی]* قۆڕی؛ غۆڕی؛ گونشۆڕی ☰ فتق بیضه

**گونتک** / guntik/: ☜ گونك[١]ـ١

**گونتولە** / guntule/: ناو. جۆرێ ترێ ☰ نوعی انگور

**گونج** / gunc/: ناو. ١. بەردی کون کە دە جێگەی ئاو بەردانی ئەستێرک دەگیرێ ٢. زەنبوورە؛ تەنبوورەی ئاسیاو ٣. مێشەنگوین و زەرگەتە و ژەنگەسوورە و ... ٤. لوولەیەکی چکۆلە بە لێواری پان و هەڵگەڕاوەوە کە لە سەر لوولەی ئاوڕۆوە دایدەنێن ٥. دەفرایەتی؛ توانایی جێ بوونەوە ☰ ١. سنگ سوراخ شده در مجرای استخر ٢. مخرج آب از ناو آسیا ٣. انواع زنبور ٤. کفشور ٥. گُنجایش

**گونجان** / guncan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //گونجای؛ دەگونجێی؛ بگونجێ// گونجین: ١. جێگە بوونەوە ‹تا ئەگونجێ تێی کە!› ٢. ئۆقرە گرتن؛ داسەکنان ‹بە هیچ بارێ و لە هیچ شوێنێ ناگونجێ!› ٣. سازان؛ سەرکردن ‹پێکەوە گونجاون› ☰ ١. جا شدن ٢. آرام گرفتن ٣. سازش کردن؛ ساختن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: گونجاو/ چاوگی نەرێنی: نەگونجان

**گونجاندن** / guncandin/: چاوگ. تێپەڕ. //گونجاندت؛ دەگونجێنی؛ بگونجێنە// گونجانن: ١. جێ بۆ کردنەوە ‹ئەم کارەش لە ناو بەرنامەکانتدا بگونجێنە› ٢. ساز دانی کار ☰ ١. گُنجانیدن ٢. سامان دادن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەگونجاندن

**گونجانن** / guncanin/: ☜ گونجاندن

**گونجاو** / guncaw/: ئاوەڵناو. لەبار؛ ڕێکوپێک. هەروەها: **گونجاوی** ☰ سنجیده

**گونجایشت** / guncayişt/: ناو. ١. ڕەوتی بە سەر بردنی ژیان ٢. بار و توانایی جێگە بوونەوە ☰ ١. امرار زندگی ٢. گُنجایش

**گونجڕ** / guncir̂/: ئاوەڵناو. *[شووروەیی، پلار]* جینگن؛

تووش ≡ شرور

**گـونجگیر** / guncgîr/: نـاو. کاسەڵەشـینکە؛ ئەسپەشینە ≡ پرندەی سبزقبا

**گونجـۆڤر** / guncovir/: ئاوەڵـناو. باوەعـەمرە؛ چڵەنۆک؛ باوەقۆرەت ≡ کوتوله

**گونجە** / gunce/: نـاو. سـۆلینە؛ ڕێگـەئاوی لـە سواڵەت ≡ تنبوشه؛ آبراه سُفالین

**گونجـەزەردە** / guncezerde/: نـاو. زەدەواڵـە؛ زەرگەتە ≡ زنبور زرد

**گونجەسورخە** / guncesurxe/: نـاو. ژەنگەسـوورە؛ سوورەمۆزە ≡ زنبور درشت قرمز

**گونجەلـو** / guncelû/: نـاو. کـونی زەردەواڵـە ≡ سوراخ زنبور

**گونجەنە** / guncene/: نـاو. دۆخـین؛ بەنـەخوێن؛ هۆجەنە ≡ بند تُنبان

**گونجین** / guncîn/: ☜ **گونجان**

**گونچڕ**[١] / gunçiř/: ناو. کـەمێ لـە هـەویر کـە لـە ئەنگوتک دەکرێتەوە ≡ تکه خمیری کـه از چونـه می‌بُرند

**گونچڕ**[٢]: ئاوەڵکار. کەمێ؛ چکێ ≡ اندکی

**گوند** / gund/: ناو. گون؛ دێ؛ دێهات ≡ دِه؛ روستا

**گوندرانـدن** / gund(i)randin/: چـاوگ. خلـۆر کردنەوە ≡ غلتاندن

**گوندک** / gundik/: ناو. ١. ☜ **گونـك**[١]**ـ١** ٢. دێ بچووک ٣. گیایەکە مالاتی وردەی پێ دەمرێ ≡ ١. ☜ **گونك**[١]**ـ١** ٢. دهکـدەی کوچـک ٣. گیـاهی سمی قاتل بُز و گوسفند

**گونـدوش** / gunduş/: نـاو. گنـدۆش؛ گونـووش؛ گونـۆژ؛ گونـۆش؛ شـووژن؛ سـووژن؛ کونـدوش؛ کندوش؛ گۆچەوەن ≡ جوالدوز

**گونـدۆر** / gundor/: نـاو. ١. گونـدۆڕ؛ کالـەک ٢. کوندر؛ کوولەکە ≡ ١. خربُزه ٢. کدو

**گوندۆڕ** / gundoř/: نـاو. ١. ☜ **گوندۆرـ١** ٢. ☜ **گوندوور**

**گونـدوور** / gundûr/: نـاو. گتـوڕ؛ گونـدۆڕ؛ گونـۆڕ؛ قەڵەندوور؛ دۆریە ≡ گیاهی است

**گوندە**[١] / gunde/: ناو. ١. جەوی گوێنی ٢. خـەتی جوان و ڕێکوپێک نووسراو ≡ ١. انگُم گیـاه گَـوَن ٢. خط زیبا و آراسته

**گوندە**[٢]: ئاوەڵناو. قەڵەو؛ چاخ ≡ چاق

**گوندەراتـو** / gunderatû/: ئاوەڵـناو. *[شـوورەیی]* گوندەرهاتگ؛ خەساو؛ خەسیو ≡ اخته

**گوندەرهاتگ** / gunderhatig/: ☜ **گوندەراتو**

**گـوندەرهاتـو** / gunderhatû/: ئاوەڵـناو. *[شـوورەیی]* ئەختە؛ خەساو؛ خەسـیاو؛ خەسـیاگ. هـەروەها: **گوندەرهێن** ≡ اخته

**گوندەڵ** / gundeł/: ناو. گـەپ؛ گاڵـتە؛ شـۆخی ≡ شوخی؛ مزاح

**گونـدەڵبەست** / gundełbest/: نـاو. گونەڵبەسـت؛ کاری چا کردنەوە؛ دروست کردنـەوەی خراوبـوو ‹وای تێک داوە بە هیچ شتێ گوندەڵبەست نابێ› ≡ مرمت؛ تعمیر

**گوندەڵە** / gundełe/: ناو. ١. کفتە؛ شامی‌کەواو ٢. پشتێنی چەرمینی ڕاوکەر ≡ ١. کوفته ٢. تـوبرەی شکارچی

**گونـدەنـوس** / gundenûs/: نـاو. خـەتات؛ خـۆش‌نـووس. هـەروەها: **گوندەنووسی** ≡ خوشنویس

**گوندی** / gundî/: ئاوەڵـناو. دێهـاتی؛ دێنشـین ≡ روستایی؛ دەنشین

**گوندێن** / gundên/: ناو. *[شـوورەیی]* بەشێ لە ئەندام کە گونانی تێدان ≡ کیسەی بیضه

**گوندێنە** / gundêne/: ☜ **گونگێتە**

**گونرو** / gunrû/: ئاوەڵناو. *[شوورەیی، پلار]* دڵناسـک و دایم تووڕە ≡ زودرنج آتشی

**گـونڕەش** / gunřeş/: ئاوەڵـناو. *[شـوورەیی، کینایـە]*

زۆردار؛ ملهوڕ 🇮🇷 زورمند

⊡ **گونڕەش خۆ دیتن:** *[شوورەیی، پلار]* تووشی لە خۆ زۆردارتر بوون 🇮🇷 با زورمندتر از خود روبرو شدن

**گونشـۆڕ / gunşoř/:** ئاوەڵناو. *[شـوورەیی]* ڕتلـۆ؛ گـونهەڵمساو؛ گـونپەنـەماو؛ بـاتوو بـاکردوو. هەروەها: **گونشۆڕی** 🇮🇷 فتقی

**گونشێر / gunşêr/:** ناو. ژەنگەسـوورە؛ سـوورەمۆزە 🇮🇷 زنبور قرمز

**گونک[1] / gunik/:** نـاو. ١. گنـدک؛ گوتـک؛ گـود؛ گودامیری؛ گونتک؛ گر؛ گرتک؛ گرتکە؛ گفشـک؛ ئەنگوتک؛ گونکێ؛ ئەوەندە لە هەویر کە بۆ نانێک جیا دەکرێتەوە ٢. *[شوورەیی]* گون؛ هێلکەگون 🇮🇷 ١. چونەی خمیر ٢. خایە

⊡ **گونکی سەر دڵ:** *[کینایە]* منداڵی زۆر خۆشەویست 🇮🇷 فرزند دلبند

⊡ **گونک گرتن:** ١. ئەنگوتک گرتن؛ ئەنگوتک خـڕ دان ٢. ☜ **گون گـرتن** 🇮🇷 ١. چونـه گـرفتن ٢. ☜ **گون گرتن**

**گونک[2]:** ئاوەڵناو. قۆڕ؛ قێرە 🇮🇷 فتقی

**گونـکژمێر / gunikj(i)mêr/:** ئاوەڵـناو. *[کینایـە]* گونکەژمار؛ ئەنگوتکژمێر؛ ڕەزیل؛ ڕژد؛ چکـووس 🇮🇷 خسیس

**گونکە / gunke/:** نـاو. ١. خەساس ٢. جۆرێ ترێی گلوو گەورە 🇮🇷 ١. اختەکننده ٢. نوعی انگور درشت

**گونکەژمار / gunkej(i)mar/:** ☜ **گونکژمێر**

**گونکەنـە / gunkene/:** نـاو. *[شـوورەیی]* ١. کـاری خەساندن ٢. خەساس 🇮🇷 ١. عمل اختـه کـردن ٢. اختەکننده

**گونکێ / gunkê/:** ☜ **گونک[1]ـ١**

**گونگ / gung/:** ناو. گیای بژار؛ گیای بـە زیـان لـە کێڵگەدا 🇮🇷 گیاه هرز

**گونگلۆک / gung(i)lok/:** ناو. ڕەبەنۆک؛ گوڵەمێلاقە 🇮🇷 شقایق نُعمانی

**گونگولی / gungulî/:** ئاوەڵناو. پرمووت؛ پرپشت (پرچ) 🇮🇷 پُرپُشت (موی سر)

**گونگونۆک / gungunok/:** ناو. گیای زەرەند 🇮🇷 گیاه زرند

**گونگونەسـەگانە / gungunesegane/:** ☜ **گونەسەگانە**

**گونگێنـە / gungêne/:** نـاو. گوندێنـە؛ تلـیتی خووساوی لێکهاڵاو 🇮🇷 ترید خمیرشده

**گونلە / gunle/:** ئاوەڵناو. *[پلار]* کنک؛کورتـەباڵا 🇮🇷 کوتاەقد

**گونماسیو / gunmasîw/:** ☜ **گونەك ـ١**

**گونـۆ / guno/:** ئاوەڵـناو. *[شـوورەیی]* خەسـاو؛ خەسیاگ؛ گوندەرهاتگ 🇮🇷 اختەشده

**گونۆڕ / gunoř/:** ☜ **گوندور**

**گونۆژ / gunoj/:** ☜ **گوندوش**

**گونۆش / gunoş/:** ☜ **گوندوش**

**گونۆڵە / gunołe/:** ☜ **گلۆڵە**

**گونـۆیی / gunoyî/:** نـاو. *[شـوورەیی]* قـۆڕی؛ گـون پەنەماوی 🇮🇷 بیماری فتق بیضه

**گونووش / gunûş/:** ☜ **گوندوش**

**گونە / gune/:** ئاوەڵناو. ١. *[پلار]* گونلە؛ کورتەباڵای خڕکەلە ٢. *[شوورەیی]* گونۆ؛ خەساو 🇮🇷 ١. کوتاەقـد چاق ٢. اخته

⊡ **گونە کرن:** خەساندن؛ گون دەرهێنـان 🇮🇷 اختـه کردن

**گونەتوڵە / gunetułe/:** نـاو. عەلووکی زەرد 🇮🇷 آلـو زرد

**گونەسر / gunesir/:** ☜ **گوژاڵك**

**گونەسوورە / gunesûre/:** نـاو. باجاناسـوور؛ تەماتـە؛ تۆماتێز 🇮🇷 گوجەفرنگی

**گونەسەگانە / gunesegane/:** ناو. گونگونەسـەگانە؛ گیایەکی بنخڕی بۆگەنە بۆ ڕەنگی بـەن بـە کـار دێ 🇮🇷 پیاز موشی

**گونەشەیتانە** / guneşeytane/: ناو. شەیتانۆکە؛ چاوشەیتانە؛ هێلکەشەیتان ☰ حلزون

**گونەقەلە** / guneqele/: ناو. جۆرێ ترێی ڕەشی پێست ئەستوورە ☰ نوعی انگور سیاه

**گونەک** / gunek/: ناوەڵناو. *[شووره‌یی]* ١. قۆڕ؛ گونماسیو ٢. *[کینایه]* بێچارە؛ کلۆڵ ☰ ١. مُبتلا به فتق ٢. بیچاره؛ درمانده

**گونەکار**[1] / gunekar/: ناو. *[شووره‌یی]* خەساس؛ ئەوی کاری خەساندنە ☰ اخته‌کننده

**گونەکار**[2]: ناوەڵناو. ١. تاوانبار ٢. درۆزن ☰ ١. مُقصر ٢. دروغگو

**گونەکەڵەبابە** / gunekełebabe/: ناو. گونەکەڵەشێرە؛ گیایەکە بەرێکی خڕی چکۆڵە دەگرێ ☰ گیاهی است

**گونەکەڵەشێرە** / gunekełeşêre/: ☜ **گونەکەڵەبابە**

**گونەکەڵەشێری** / gunekełeşêrî/: ناو. جۆرێ ترێی دەنک زل و درێژ ☰ نوعی انگور

**گونەکی** / gunekî/: ناو. *[شووره‌یی]* قۆڕی؛ نەخۆشی گون ئاوسان ☰ بیماری فتق بیضه

**گونەگیسک** / gunegîsk/: ناو. *[شووره‌یی، پەلار]* گونەگێسک؛ کورتەبالا ☰ کوتاەقد

**گونەگێسک** / gunegêsk/: ☜ **گونەگیسک**

**گونەل** / gunel/: ناو. تاف جوانی؛ هەرەتی گەنجی ☰ عنفوان جوانی

**گونەڵ**[1] / guneł/: ناو. ١. گلۆڵەبەن ٢. کفتە ٣. خڕی پڕ بە چنگ ☰ ١. گروهه نخ ٢. کوفته ٣. گرد پُرِ یک مشت

**گونەڵ**[2]: ناوەڵناو. کورتەبالا ☰ کوتاەقد

**گونەلان** / gunełan/: ناو. دومبەلان؛ چمە ☰ دُنبلان

**گونەلانی** / gunełanî/: ناو. تۆپەڵەشەڕە؛ تۆپەڵەشەڕێ؛ شەڕەتۆپی بەفر ☰ برف‌بازی

**گونەڵبەست** / gunełbest/: ☜ **گوندەڵبەست**

**گونەڵە**[1] / gunełe/: ناو. کفتە؛ شامی کەواو ☰ کوفته

**گونەڵە**[2]: ناوەڵناو. خڕ وەک تۆپی دەست ☰ کروی کوچک

**گونەڵەلووتە** / gunełelûte/: ناوەڵناو. *[پەلار]* سەری لووت گەورە و خڕ ☰ دارای نوک دماغ بزرگ و گرد

**گونەوێڵە** / gunewêłe/: ناو. *[شووره‌یی]* گون و جێگەی گون پێوە هەڵاوەسراو ☰ خایه و خایه‌آویز

**گونەه** / guneh/: ☜ **گوناه**

**گونەهبار** / gunehbar/: ☜ **گوناهبار**

**گونەهکار** / gunehkar/: ☜ **گوناهبار**

**گونهەڵمساو** / gunhełm(i)saw/: ناوەڵناو. *[شووره‌یی]* ڕتلۆ؛ گونپەنەماو ☰ فتقی

**گونیا** / gunya/: ناو. گوونیا؛ گۆشەوارە؛ ئامرازێکی سێ سووچە بە سووچێکی ڕاستەوە، لە پەلاستیک یان کانزا بۆ کێشان و تاقی کردنەوەی گۆشەی ڕاست (٩٠°) ☰ گونیا

**گونێنە** / gunêne/: ناو. چێشتێکە لە دۆینەی تازە چێ دەکرێ ☰ نوعی آش ترخینه

**گوە** / g(i)we/: ناو. گوێ؛ ئەندامی بیستن ☰ گوش

**گوەستێرە** / g(i)westêre/: ناو. ئەستێرۆک ☰ کرم شبتاب

**گوەسم** / g(i)wesim/: ناو. هەزارپێ ☰ هزارپا

**گوەش** / g(i)weş/: ☜ **گوێ**

**گوەفڕە** / g(i)wef(i)ře/: ناوەڵناو. گوێنەدەر؛ گەللایی ☰ لاأبالی

**گوەل**[1] / g(i)wel/: ناو. ١. ☜ **گۆلاو** ٢. کون لە دیوار بۆ ڕوانگە ☰ ١. ☜ **گۆلاو** ٢. سوراخ دیدبانی در دیوار

**گوەل**[2]: ناوەڵناو. جغزی؛ خڕی ☰ مُدور

**گوەمە** / g(i)weme/: ناو. مۆڵ؛ پەچەی پەز بۆ شەوێن ☰ شبغاز گوسفندان

**گوەند** / g(i)wend/: ناو. پەتی قوڵەی ئەستووری

مووبین 🇮🇷 طناب کوتاه و کلفت پشمی

**گوەنیرک / g(i)wenîrik/:** ☜ **گوەنێر**

**گوەنێر / g(i)wenêr/:** ناو. گوەنیرک: ١. جەنگەی بەران تێبەردان ٢. هەڕەتی جووت بوونی حەیوانەکێوی 🇮🇷 ١. موسم جفتگیری در گله ٢. موسم جُفتگیری حیوانات وحشی

**گوه / guh/:** ☜ **گوێ**

▣ **گوهێ شەیتانکە** گوژاڵک؛ کاڵەکەمارانە 🇮🇷 هندوانەی ابوجهل

**گوهێ شەیتێن** گووژە؛ عەنزەرووت 🇮🇷 انزروت

**گوهار / guhar/:** ناو. ١. ☜ **گواره** ٢. ڕەوتی گۆڕان 🇮🇷 ١. ☜ **گواره** ٢. تغییر

**گوهارتن / guhartin/:** چاوگ. گۆڕین 🇮🇷 تغییر دادن

**گوهارتو / guharto/:** ئامراز. وەک؛ وەکوو؛ لە چەشنی 🇮🇷 مانندِ

**گوهارتوو / guhartû/:** ئامراز. لە بری؛ لە جیاتی؛ لە باتی؛ بە جێی 🇮🇷 به جای

**گوهارک / guharik/:** ☜ **گواره**

**گوهارون / guharun/:** ناو داری نێوان دەندە و ئێرەقە 🇮🇷 چوب میان چوب خیش و جای گاوآهن

**گوهارۆک[1] / guharok/:** ناو. ئالقەی دەرگا کوتان 🇮🇷 حلقەی در

**گوهارۆک[2]:** ئاوەڵناو. چکۆلەی جەغزی 🇮🇷 حلقەدار

**گوهازتن / guhaztin/:** ☜ **گواستنەوه**

**گوهاستن / guhastin/:** ☜ **گواستنەوه**

**گوهاستۆ / guhasto/:** ناو. کاری لە ڕوو نووسینەوە؛ لاسایی لە نووسیندا 🇮🇷 نُسخەبرداری

**گوهان / guhan/:** ☜ **گوان[2]**

**گوهاندار / guhandar/:** ☜ **گواندار**

**گوهبزن / guhb(i)zin/:** ناو. گیایەکی دەشتەکییە 🇮🇷 از گیاهان علفی

**گوهبەران / guhberan/:** ☜ **گوێبەرخۆڵە**

**گوهتێل / guhtêl/:** ناو. سەروبەندی تێبەربوونی حەیوانی کێوی 🇮🇷 موسم جفتگیری حیوان کوهی

**گوهچک / guhçik/:** ناو. گوێچکەی دڵ 🇮🇷 بخشی از قلب که شبیه گوش است

**گوهدار / guhdar/:** ☜ **گوێگر**

**گوهداری / guhdarî/:** ☜ **گوێداری**

**گوهدەر / guhder/:** ناو. سەرپەرشت؛ سەرپەرست 🇮🇷 سرپرست

**گوهدەرز / guhderz/:** ئاوەڵناو. ١. گوێکەت ٢. دوور لە گاڵتە ٣. وریا و لەسەرهەست 🇮🇷 ١. ویژگی شخصی که بخشی از گوشش بریده باشد ٢. جدّی ٣. زیرک و باهوش

**گوهراندن / guhrandin/:** ☜ **گوهێراندن**

**گوهری / guhrî/:** ☜ **گۆری-١**

**گوهرەپ / guhřep/:** ئاوەڵناو. ١. گوێزل ٢. *[کینایە]* نەزان؛ گێل 🇮🇷 ١. بزرگ گوش ٢. نادان

**گوهسارە / guhsare/:** ناو. ئەستێرۆک؛ گوڵەستێرە 🇮🇷 کرم شبتاب

**گوهش / guhş/:** ناو. ١. کەوش؛ ڕەوتی بووردنەوە؛ دڵ بوورانەوە؛ کەوشین ٢. پاژنەی کەوش 🇮🇷 ١. غش ٢. پاشنەی کفش

**گوهشک / guhişk/:** ناو. ڕەفیسکە؛ ڕەپیسکی قەڵەوی بن ئەژنۆ 🇮🇷 زردپی درشت زیر زانو

**گوهشی / guhşî/:** ئاوەڵناو. دڵلەخۆچوو؛ بێهۆشکەوتوو 🇮🇷 غش‌کرده

**گوهشین / guhşîn/:** چاوگ. ترسان؛ سام کردن 🇮🇷 ترسیدن

**گوهک / guhik/:** ناو. نەرمەی گوێ 🇮🇷 نرمەی گوش

**گوهکون / guhkun/:** ☜ **گوێقولاخ**

**گوهکەرک / guhkerk/:** ☜ **گوهکەرۆك**

**گوهکەرۆک / guhkerok/:** ناو. گوهکەرک؛ گیایەکە دەرمانی مایەسیرییە 🇮🇷 گیاهی دارویی

**گوهگران / guhg(i)ran/:** ☜ **گوێگران**

**گوهماسی / guhmasî/:** ☜ **گوێماسیلە**

**گوهماکەر** / guhmaker/: ئاوەڵناو. *[پلار]* بێ‌ئاوەز؛ بێ‌عەقڵ؛ نەفام ▤ ابله

**گوهمشک** / guhmişk/: ☜ **گوێ‌مشکە-١**

**گوهن** / guhn/: ناو. ١. گونەل؛ تافی جوانی؛ هەڕەتی لاوی ٢. پیو؛ چەوراییی ناو زگ ▤ ١. عنفوان جوانی ٢. پیه

**گوهۆڕ** / guhoř/: ناو. گۆڕ؛ زەوی تەخت ▤ زمین هموار

**گوهوور** / guhûr/: ناو. ١. پەین ٢. زبل و زاڵ ٣. شتی زێدە و بێکارە ▤ ١. پهن ٢. آشغال ٣. آت و آشغال

**گوهووشک** / guhûşk/: ☜ **گۆیژ**

**گوهەر** / guher/: ناو. ١. ☜ **گەوڕ** ٢. زەنج بۆ ئاژەڵ ▤ ١. ☜ **گەوڕ** ٢. محوطه‌ی محصور از نی برای نگهداری دام

**گوهەڕ** / guheř/: ناو. ١. شت بە شت ٢. گۆڕایی لە نێوان دوو تەپک و بڵندایيدا ▤ ١. مُعاوضه ٢. درّه‌ی فراخ

**گوهەڕاندن** / guheřandin/: چاوگ. گۆڕینەوەی شت بە شت ▤ مُعاوضه کردن

**گوهەڕین** / guheřîn/: چاوگ. ١. گۆڕینەوە؛ شت بە شت کردن ٢. گۆڕین؛ شتێ لە جێی شتی تر دانان ▤ ١. مُعاوضه کردن ٢. جایگزین کردن

**گوهیراندن** / guhîrandin/: چاوگ. گوهراندن؛ گۆڕین ▤ جایگزین کردن

**گوهیژ** / guhîj/: ☜ **گۆیژ**

**گوهیش** / guhîş/: ناو. داری حەیزەران؛ خەیزەران ▤ خیزران

**گوهیشک** / guhîşk/: ناو. ١. ☜ **گۆیژ** ٢. ڕەفیسکەی بن ئەژنۆ ▤ ١. ☜ **گۆیژ** ٢. زردپی پشت زانو

**گوهێر** / guhêr/: ناو. گوەنێر؛ گۆن؛ گۆهن؛ گوهتێل؛ سەردەمی تێبەربوونی کێویان ▤ موسم جفتگیری حیوانات کوهی

**گوهێڕ** / guhêř/: ناو. سەڕاف؛ دراوگۆڕەوە ▤ صرّاف

**گوهێڕبار** / guhêřbar/: ئاوەڵناو. شیاوی گۆڕان ▤ قابل تغییر

**گوهێڕک** / guhêřik/: ناو. جێگەی پارە گۆڕینەوە ▤ صرّافی

**گوهێڕەک** / guhêřek/: ناو. کاری وەگۆڕانی شت بە شت ▤ مُعاوضه

**گوهێز** / guhêz/: ئاوەڵناو. ڕاگوێز ▤ مُنتقل کننده

**گوهێزۆک** / guhêzok/: ناو. عارەبانە؛ ▤ گاری

**گوهێژ** / guhêj/: ☜ **گۆیژ**

**گوێئاسارە** / g(i)wî'asare/: ☜ **گوڵەستێرە-١**

**گوێچ** / g(i)wîc/: ناو. ڕەنگی قاوەیی کاڵی ئامال سپی ▤ رنگ کِرِم

**گوێرج** / g(i)wîric/: ناو. گۆیژ؛ بلچ ▤ زالزالک

**گوێرچ** / g(i)wîrç/: ☜ **گۆیژ**

**گوێرمکە** / g(i)wîreke/: ☜ **گوێرەکە**

**گوێشک** / g(i)wîşk/: ☜ **گۆیژ**

**گوێن** / g(i)wîn/: ☜ **گوان**[٢]

**گوێنی** / g(i)wînî/: ☜ **گەون**

**گوێە** / guye/: ☜ **گوێ**

**گوێەند** / guyend/: ناو. گوەند؛ پەتی ئەستووری قوڵە لە مووی بزن ▤ رسن کوتاه و کلفت از موی بُز

**گوێ** / g(i)wê/: ناو. گوچک؛ گوه؛ گوەش؛ گوێە؛ گۆ؛ گۆچک؛ گۆش؛ گۆه؛ گوو؛ گێ؛ گێچکە؛ گوێچکە؛ گوێچک؛ گووش: ١. ئەندامی بیستن و ڕاگرتنی هاوسەنگی ‹دەبێ مەلا تەهای دۆستم بانگی بە گوێدا لێ دا و ناوی بنێ عەبدوڕڕەحمان «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. *[مەجاز]* هەستی ژنەوایی ‹گوێم گران بووە› ٣. قەراخ؛ کەنار ‹لە گوێ چەمێ دانیشین› ▤ ١و٢. گوش ٣. لبه؛ کنار

◻ **گوێ بۆ کەسێ/ شتێ شل نەبوون**: گرنگی نەدان؛

پاپە نەبوون ☰ اهمیت ندادن

**گوێ بۆ گرتن:** سەرنج دان بۆ تێگەیشتنی شتێک ☰ گوش دادن

**گوێ پێوە بون:** بیستن؛ بەر گوێ کەوتن ‹مـن خۆم گوێم پێوە بوو چت دەگوت؛ ئەویش گوێی بە قسەکانتەوە بوو› ☰ شنیدن

**گوێ تەکاندن:** بە هەموو هەست گوێ دان ☰ گوش تیز کردن

**گوێ جەڕ دان:** *[کینایە]* تەمێ کردن ☰ گوشمال دادن

**گوێ خەفاندن:** ☜ **گوێ لێ ئاخنین**

**گوێ دان:** گۆش دان: ١. گوێ بۆ قسە ڕاگرتن ‹تۆ خوا ئازیز! زولفان عەنبەرین!/ گوێ بدە وە حەرف بەندەی کەمتەرین «عەبدوڵلا بەگی جاف»› ٢. خەمخۆری کردن ☰ ١. شنیدن ٢. غمخواری کردن

**گوێ ڕادێران:** گوێ گرتن ‹قەل کوتی باشە کە گوێ ڕادێری/ پەندی من پاکی بە دڵ بسپێری «سوارە»› ☰ گوش فرادادن

**گوێ ڕاگرتن:** گوێ گرتن ‹وەرە گوێ ڕاگرە بۆ پەندی دایکت/ فەرەحبەخشی دەروونی بێقەراریم! «خاتوو خوەرشیدی مەریوانی»› ☰ گوش فرادادن

**گوێ زرینگان:** ١. دەنگەدەنگ لە ناو گوێ هاتن ٢. *[کینایە]* هۆش هاتنە بەر و بەئاگا بوون ☰ ١. صدا دادن گوش ٢. شست بیدار شدن

**گوێ زرینگانەوە:** دەنگ لە گوێ هاتن ‹کە گوێم زرینگایەوە وا دەنگی زەنگی وشتری لەیلە/ ئەوا لەو لایشەوە مەجنوونە دەگری شیوەنە ئەمشەو «پیرەمێرد»› ☰ صدا دادن گوش

**گوێ شل کردن:** گوێ بۆ قسە ڕاگرتن ☰ گوش فرادادن

**گوێ قولاخ کردن:** گوێ تیژ کردنەوە؛ دەنگ و جووڵە لە خۆ برین بۆ باشتر بیستن ☰ گوش تیز کردن

**گوێ کپ بون:** باش نەبیستن (بە هۆی نەخۆشی یان کەوتنە بەر دەنگێکی بەقەوەتەوە) ☰ گوش کیپ شدن

**گوێ کپ کردن:** ١. ڕێگای بیستن بەستن ٢. *[کینایە]* لە گوێ نەگرتن؛ بایەخ پێ نەدان ‹گوێ کپ کەن و مەبیسن وەعدەی بەتاڵ و زل ـ زل! «مەلا غەفوور»› ☰ ١. گوش خود را گرفتن ٢. اهمیت ندادن

**گوێ گران بون:** کەم یان بە سەختی بیستن ☰ گوش سنگین شدن

**گوێ گرتن:** گوێ دان بە قسە ‹سەد قافلە ڕابورد و ئەتۆ غافلی ئەی دڵ!/ گوێ بگرە لە هەر لایێ کە ناڵەی جەرەسێکە «تاهیر بەگ»› ☰ گوش فرادادن

**گوێ لە قسە پڕ بون:** *[کینایە]* پێشتر قسەی وا بیستن و بە لاوە گرنگ نەبوون ‹گوێم لەم قسانە پڕە› ☰ گوش کسی پر بودن

**گوێ لێ ئاخنین:** گوێ لێ خەفاندن؛ گوێ خەفاندن؛ تەمەڵی کردن؛ خستنە پشتگوێ ☰ پشت گوش انداختن

**گوێ لێبون:** بیستن؛ شنەوتن ‹لە حەنجەرەی زەمانەوە/ گوێم لە زەمزەمەی زوڵاڵی خێزە وردەکانی کانییە «سوارە»› ☰ شنیدن

**گوێ لێ خەفاندن:** ☜ **گوێ لێ ئاخنین**

**گوێ نەدان:** گوێ پێ نەدان؛ خۆ لێ بواردن ☰ توجه نکردن

**گوێ هەڵخستن:** *[مەجاز]* پەنامەکی گوێ گرتن ‹بۆ یەکەم جار لە ژیانا خۆم گرت، چونکە بابم خۆ لە خەڵک گرتن و گوێ لە قسەی خەڵک هەڵخستنی زۆر پێ ناخۆش بوو «هێمن»› ☰ فالگوش ایستادن

**بە گوێدا سرکاندن:** بە پچەوە گوتن ‹یەکێک بە

گوێیدا سرکاندم: کابرایەک لەم دێیە دەیەوێ بتبینێ و ناوێرێ بێتە مالی ئاغا «هەژار، چێشتی مجێور» ☰ درگوشی گفتن

**بە گوێ کردن:** بە قسە کردن ‹بە گوێم کرد و کتێبەکەم سەند› ☰ گوش دادن

**بە گوێی کەسێکدا خوێندن:** *[کنایە]* کەسێ پڕ کردنەوە ☰ گوش کسی را پر کردن

**بە گوێی کەسێکدا دان/ هێنان:** *[کنایە]* کەسێک بە هێماوە ئاگادار کردن ☰ به گوش کسی رساندن

**گرتنە گوێ:** *[مەجاز]* وەرگرتن؛ پەزیران؛ قەبووڵ کردن ‹نەسێحەت بگرە گوێ جانا لە لایان زۆر بە تەعزیمە/ ... «سالم»› ☰ شنیدن؛ پذیرفتن

**لە گوێی گادا نوستن/ خەوتن:** *[پلار]* تەواو بێ‌خەبەر و بێ‌خەیاڵ بوون ‹لە گوێ گا نوستوون بۆیێ کە ڕیوی/ لەسەر ئێوە وەها شێلگیرە وەک سەگ! «حاجی قادر»› ☰ کاملاً بی‌خبر و بی‌خیال بودن

**وەک گوێی کەر جووت بوون:** *[پلار]* هەمیشە پێکەوە بوون ‹زۆر نێوانمان خۆش بوو، پێکەوە دەگەڕاین، کورد گوتەنی: وەک گوێی کەر جووت بووین و بیووینە خەمڕەوێنی یەکتر «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ همیشه با هم بودن

**هاتنە (بەر) گوێ:** بیستن؛ شنەفتن ‹گفت‌وگۆیێکی خوەش و پرمەغزە دایم دێتە گوێم/ وا ئەزانم هاتیفێکی غەیبییە تەفسیر ئەکا «شێخ باباڕەسوولی بەرزنجی»› ☰ به گوش رسیدن

**گوێبڕ** / g(i)wêbiř/: ناوەڵناو. *[کنایە]* دەسبڕ؛ گووشبڕ ☰ کلاهبردار

**گوێبڕکە** / g(i)wêbiřke/: ناو. نەخۆشییەکی گوێی زارۆکانە ☰ از بیماری‌های گوش کودکان

**گوێبڕە** / g(i)wêb(i)ře/: ناو. پەینی زەرعات ☰ کود حیوانی

**گوێبەرخۆڵە** / g(i)wêberxołe/: ناو. گوهبەران؛ گوێبەرخە؛ گوێ‌کار؛ گۆشتبەرخۆک؛ گۆشتەبەرغیلە؛ گۆشەبەرخیلە؛ گیایەکە دەخورێ ☰ گیاهی خوراکی

**گوێبەرخە** / g(i)wêberxe/: ☜ گوێبەرخۆڵە

**گوێبەفەرمان** / g(i)wêbeferman/: ناوەڵناو. ژێردەست؛ بەردەستە ☰ فرمانبردار

**گوێبەگوێ** / g(i)wêbeg(i)wê/: ئامراز. *[کنایە]* پێکەوەجووت؛ دۆستایەتی زۆر توند ☰ شانه به شانه

**گوێبەڵ**[1] / g(i)wêbel/: ناو. *[کنایە]* جاسووس؛ شوفار ☰ جاسوس

**گوێبەڵ**[2]: ناوەڵناو. گۆبەڵ؛ گوێچکەقوت ☰ گوش برجسته

**گوێبەلە** / g(i)wêbele/: ناو. خەیاردێمی؛ کالەکەمارانە؛ شوویتەمارانە ☰ هندوانەی ابوجهل

**گوێبەهیچنەدەر** / g(i)wêbehîçneder/: ناوەڵناو. کەمتەرخەم؛ بێ‌مبالات؛ خوێن‌سارد ☰ لاأُبالی

**گوێبیس** / g(i)wêbîs/: ناوەڵناو. گوێبیست: ١. گوێدەر بە قسەی لە خۆ گەورەتر ٢. ئاگادار؛ خەبەربیستوو ٣. *[کنایە]* کوڵەکەر؛ قسەبەر ☰ ١. حرفشنو ٢. خبردار ٣. خبرچین

◘ **گوێبیس بوون:** گوێ گرتنی پەنامەکی؛ کوڵە گرتن ☰ فالگوش ایستادن

**گوێبیست** / g(i)wêbîst/: ☜ گوێبیس

**گوێ پچڕ** / g(i)wêp(i)çiř/: ناو. گوێچکەپچڕکێ: ١. کێبەرکێ لە ڕفاندندا ٢. کێبەرکێ لە هەڵگرتنەوەی شت لە عەرز ☰ ١. مسابقه در ربودن ٢. مسابقه در برچیدن از روی زمین

**گوێ پچڕ. گوێ پچڕ** / g(i)wêp(i)çiř g(i)wêpiçiř/: ناوەڵکار. گوپچڕ ـ گوپچڕ؛ گوێچکەپڕوچکێ: ١. بە دژواری و زەحمەتی زۆرەوە ٢. بە پەلەپەل ☰ ١. با هزار زحمت ٢. با شتاب زیاد

**گوێ پروچکێن** / g(i)wêp(i)ruçkên/: ناو. کاری

گـوێی یـەکتر کێشـان لـە سـەر شـت ☰ گـوش همدیگر را بر سر چیزی کشیدن

**گـــــــوێ پڕوچکێن** / g(i)wêp(i)řuçkên/: ☜ **گوێچکەپچڕکێ ـ٢**

**گوێ پڕووسقێنە** / g(i)wêp(i)řûsqêne/: ناو. نـاوی یارییەکی مندالانە ☰ از بازی‌ها

**گوێت** / g(i)wêt/: ناو. دڵ؛ کووپە؛ خاڵێکی سووری لە بیچمی دڵە لە پەڕی قوماردا ☰ دل؛ خال ورق

**گوێ تـەقێ** / g(i)wêteqê/: نـاو. گوێچکەتـــەقێ؛ کاری گوێ قوت کردن بۆ قسەی خەڵک ☰ عمل گوش تیز کردن

**گـوێ تیر** / g(i)wêtîr/: نـاو. ئـەو ئـامرازەی ژێـی کەوانی پێ توند و شل دەکرێ ☰ ابـزار تنظـیم زه کمان

**گوێج** / g(i)wêc/: ☜ **گۆێژ**

**گوێ جمجمەکی** / g(i)wêcimc(i)mekî/: ناو. جۆرێ هەنگوورە ☰ نوعی انگور

**گوێجەڕ** / g(i)wêceř/: ناو. تەمێ؛ کاری ژێر کردن ☰ تنبیه

**گوێچ** / g(i)wêç/: ناو. ١. پارە و جگێ کە لە کایەدا دادەکرێ ٢. بەش؛ بارە؛ پارە ☰ ١. پول یا شتالنگی کە بر زمین می‌گذراند و با تیله مـی‌زننـد ٢. قسـمت؛ سهمیه

**گوێچک** / g(i)wêçik/: ☜ **گوێچکە**

**گوێچکە** / g(i)wêçke/: ناو. گوێچک؛ گێچووک: ١. گـوێ؛ گـوش ٢. سـووچ؛ قـوژبن ٣. بەشـی قیتـەوەبوو لـە شـتێ ☰ ١. گـوش ٢. گوشـە ٣. برآمدگی

▣ **گوێچکە ناو دان:** /کنایە/ زۆر بە وردی ئامۆژگاری کردن ☰ با دقت و حوصله نصیحت کردن

**گوێچکە تەکاندن:** ☜ **گوێچکە دان**

**گوێچکە تەکانن:** ☜ **گوێچکە دان**

**گوێچکە دان:** گوێچکە تەکاندن؛ گوێچکە تەکانن؛ گوێ بە قسە دان ☰ گوش بە حرف دادن

**گوێچکەی کەسێ زرنگیانەوە:** دەنگ لـە نـاو گـوێ کەسێک هاتن (کـە گوایـە نیشـانەی ئەوەیـە لـە شوێنێک ناویان لێ بردووە) ☰ صدا حس کردن در گوش

**گوێچکە شل کردن:** گوێ دان بـە قسـە ☰ گـوش فراداشتن

**گوێچکە گرتن:** ١. گوێ دان بە قسـە ٢. خـۆ لـە قسەی خەڵک مات کردن ☰ ١. حرف شنیدن ٢. استراق سمع کردن

**گوێچکە نەلەقیان:** ١. گـوێ نـەدان بـە قسـەی کەس ٢. گرنگ نەگرتن ☰ ١. گـوش نـدادن ٢. اهمیت ندادن

**گوێچکەی کەسێک هەرزن هەلگرتن:** /مەجاز/ گـوێ سووک بوون؛ لە سەر هەسـت بـوون ☰ گـوش حساس داشتن

**گوێچکـە پچڕکێ** / g(i)wêçkep(i)çiřkê/: نــاو. ١. ☜ **گـــــــوێ پچڕ** ٢. گوێچکەپروســـــــقێ؛ گوێ‌پڕوچکێن؛ گاڵتەی گوێی یـەکتر کێشـان ☰ ١. ☜ **گـوێ پچڕ** ٢. عمـل گـوش همـدیگر را بـە شوخی کشیدن

**گوێچکە پروسـقێ** / g(i)wêçkepirusqê/: نــاو. ١. کاری گوێ کێشانی یەکتری؛ گوێ پڕوچکێن ٢. کاری قوتکە پەڕاندن؛ سووچ پێکان لە کێبەرکێی بـەرد هاویشـتنە ئامانجـەوە ☰ ١. عمـل گـوش همدیگر را کشـیدن ٢. عمـل گوشـە زدن در پرتـاب سنگ بە هدف

**گوێچکـــــە پڕوچکێ** / g(i)wêçkep(i)řuçkê/: ☜ **گوێ پچڕ ـ گوێ پچڕ**

**گوێچکەتەقێ** / g(i)wêçketeqê/: ☜ **گوێ تەقێ**

**گوێچکەفیل** / g(i)wêçkefîl/: ☜ **گوێ فیل**

**گوێچکەماسی** / g(i)wêçkemasî/: ☜ **گوێ ماسیلە**

**گوێچکەمڵە** / g(i)wêçkem(i)ɫe/: ناو. گیایەکـە بـۆ

دەرمان دەشێ ☰ مرزنگوش

**گوێچەم** / g(i)wêçem/: ناو. بەستێن؛ ڕەخی ڕووبار ☰ کنارەی رود

**گوێچەنە** / g(i)wêçene/: ناو. بنەتەشی؛ چەرمێکی کونە دە کلکەتەشی دەخرێ ☰ حلقەای چرمی در تیر دوک

**گوێدار** / g(i)wêdar/: ناو. گۆهدار؛ گۆهدێر: ١. بیسەر؛ ئەوی دەبیسێ ٢. سەرپەرست؛ سەرپەرشت ☰ ١. شنونده ٢. سرپرست

**گوێداری** / g(i)wêdarî/: ناو. گوهداری؛ گۆهدێری: ١. گۆداری؛ کار و ڕەوتی گوێ گرتن لە قسەی کەس یان دەستەیەک ٢. سەرپەرشتی ☰ ١. شنود ٢. سرپرستی

**گوێدرمێ** / g(i)wêdirmê/: ☜ **گوێرمە**

**گوێدرێژ** / g(i)wêd(i)rêj/: ناو. [کینایە] گوێرێژ؛ گۆهدرێژ؛ کەر؛ خەر ☰ الاغ؛ خر

**گوێدەر** / g(i)wêder/: ☜ **گوێگر**

**گوێدینج** / g(i)wêdînc/: ناوەڵناو. لا؛ بێ لایەنگری ☰ بی‌طرف

**گوێدێر** / g(i)wêdêr/: ☜ **گوێگر**

**گوێر** / g(i)wêr/: ناو. ١. گۆلکی لە شیر خواردن دەرچوو ٢. ☜ **گوێل ـ٣** ٣. ☜ **گوێلە ـ١** ☰ ١. گوسالەی از شیر بُریده ٢. ☜ **گوێل ـ٣** ٣. ☜ **گوێلە ـ١**

**گوێرک** / g(i)wêrik/: ناو. بەردی خڕ و گردی ژێر بەرداش ☰ محور زیر سنگ آسیاب

**گوێرمە** / g(i)wêrme/: ناو. گوێرەما؛ گوێرمێ؛ گوێلەمە؛ گوێدرمێ؛ کاری کەم‌کەم گوان بە گوێلک مژاندن بۆ شیر دانی چێڵ ☰ بە تدریج گوساله را به مُک زدنِ پستان مادر آشنا کردن

**گوێرمێ** / g(i)wêrmê/: ☜ **گوێرمە**

⊡ **گوێرمێ دادان**: ١. خەریکی مژینی گوان بوون (ئاژەڵ) ٢. [مەجاز] ماوەیەکی زۆر مەمکی دایک چەکاندن (مرۆ) ☰ ١. مشغول شیر خوردن از پستان مادر بودن (حیوان) ٢. مدتی طولانی پستان مادر را مکیدن (انسان)

**گوێرمێ کردن**: ١. لێ‌خستن؛ گوێرەکە بەردان بۆ شیر خواردن لە گوانی دایکی ٢. [مەجاز] شیر خواردنی زارۆ ☰ ١. گوساله را برای دوشیدن مادر آزاد گذاشتن ٢. شیر خوردن نوزاد آدمی

**گوێروو** / g(i)wêrû/: ناو. ١. گرە؛ گوێر؛ گوێروو؛ گێر؛ کونی بەرداش ٢. ☜ **گوێل ـ٣** ☰ ١. سوراخ سنگ آسیا ٢. ☜ **گوێل ـ٣**

**گوێرە** / g(i)wêre/: ↓

⊡ **بە گوێرەی**: گۆرە؛ بەرانبەر بە ‹زەکات بە گوێرەی گوزەرانە› ☰ طبقِ

**گوێرەکە** / g(i)wêreke/: ناو. گچە؛ گوسال؛ گولەکە؛ گوێل؛ گۆرە؛ گۆرەکە؛ گۆسالە؛ گۆک؛ گۆل؛ گۆلک؛ گۆوەر؛ گوور؛ گوورە؛ گێلک؛ گویرەکە؛ گۆلەکە؛ گویرک؛ گوێلک؛ گۆر؛ گوێر؛ گووەر؛ گوێلپار؛ گۆرەکلە؛ کوێل؛ حۆلی؛ پارگوێل؛ پارگوێر؛ پارێنە؛ پارێن؛ پارین؛ نیەون؛ سەنگۆ؛ پانێر؛ بەچکە چێڵی نەگووراو ☰ گوسالەی یک تا دو سالە

**گوێرەکەسوورە** / g(i)wêrekesûre/: ناو. خاڵخاڵۆکە؛ مامەلەسوورە؛ مالمالەسوورە؛ مامەلەسوورە؛ مامالەسوورێ ☰ کفشدوزک

**گوێرەما** / g(i)wêrema/: ☜ **گوێرمە**

**گوێرەوسار** / g(i)wêrewsar/: ناو. گولەسار؛ گۆلەسار؛ گوێلەوسار؛ گوورەسا؛ پەتێ کە گوور و پانێری پێ دەبەستنەوە ‹گوێرەکەی مەردم گوێرەوسار نەبڕێ! «قسەی نەستەق»› ☰ افسار گوساله

**گوێرێ** / g(i)wêrê/: ناو. سارەما؛ کاری مێچک دانی بێچوو؛ مژاندنی بەر لە دۆشین بۆ شیر دادان ☰ مُک زدن بچه دام قبل از دوشیدن

**گوێرێژ** / g(i)wêrêj/: ☜ **گوێدرێژ**

**گوێرادێر** / g(i)wêřadêr/: ☜ **گوێڕایەڵ**

**گوێڕایەڵ** / g(i)wêřayeł/: ئاوەڵناو. گوێڕادێر: ١. تایبەتمەندی کەسێ کە قسەی پەند و قسەی گەورەتران بەجێ دێنێ ٢. بەرفەرمان؛ فەرمانبەر ☰ ١. پندشنو ٢. فرمانبر؛ مطیع

**گوێڕایەڵی** / g(i)wêřayełî/: ناو. ١. چۆنیەتی گوێ لە قسەی گەورەتران ڕاگرتن ٢. بەرفەرمانی؛ فەرمانبەری ☰ ١. حرف‌شنوی ٢. فرمانبرداری

**گوێ‌ڕەپە** / g(i)wêřepe/: ناو. ملەخرە؛ گووشەک؛ نەخۆشی بنان‌گوێ ئەستوور بوون ☰ اُریون

**گوێ‌ڕەش** / g(i)wêřeş/: ناو. جۆرێ پشیلەی کێوییە ☰ سیاه‌گوش

**گوێز**[1] / g(i)wêz/: ناو. ١. گۆز؛ گووز؛ گوویز؛ قۆز؛ گیز؛ گێز؛ جەوز؛ جۆز؛ جیز؛ گرتەکان؛ گردەکان؛ گردەکۆ؛ وەزی؛ وەز؛ گۆزەک؛ کوزەک؛ دارێکی بەرزی پڕ لەق و پۆی گەڵا پان کە چێوێکی ڕەق و تۆکمەی هەیە و لە پیشەسازیدا بەنرخە ٢. بەری خڕلە و توێکڵ ڕەقی ئەو دارە کە مێشکەکەی چەورە و دەخورێ ٣. گواز لە شوێنێ بۆ شوێنێ‌تر ☰ ١و٢. گردو ٣. نقل و انتقال

◙ **گوێز کوێرگ** ☜ **گوێزی کوێرو**

**گوێزی کوێرو:** گوێز کوێرگ؛ گوێزێ کە کاکڵەکەی ساق دەرنەیێت ☰ گردوی نامرغوب

**گوێزی ئازا:** گوێزی ساغ: ١. گوێزێ کە لە کاکڵەکەی ساغ و ئاسان دەر بێ ٢. *[کینایە]* مرۆی ساغ و چالاک ☰ ١. گردوی مرغوب ٢. آدم سالم و چابک

**گوێزی ساغ** ☜ **گوێزی ئازا**

**گوێزی ناو پێژنگ** *[کینایە]* بزۆزی ئۆقرەنەگر ☰ ناآرام؛ بی‌قرار

**گوێزی ناوداخڵە:** ☜ **گوێزی ناو دەغیلە**

**گوێزی ناو دەغیلە:** گوێزی ناو داخڵە: ١. گوێزی پچووک کە دەناو داخڵەی دوکانی دەخەن ٢. *[کینایە]* کورتەبالای زرنگ ☰ ١. گردوی قلک ٢. کوتاه‌قد چُست و چالاک

◙ **گوێز بە گومەزدا هەڵخستن:** *[کینایە]* ١. کاری فێڕۆ و بێ‌کەڵک ئەنجام دان ٢. ئامۆژگاری کردنی بێ‌ئەنجام ☰ ١. کار عبث کردن ٢. نصحیت بیهوده کردن

**گوێز تەکاندن:** داخستنی گوێز لە دار و چنینەوەی ☰ گردو چیدن

**گوێز لە هەمانەی خۆ بژاردن:** *[کینایە]* بە چاوی خۆوە سەیری خەڵک کردن ☰ خود را جای دیگران گذاشتن

▪ **گوێز**[2]: پاشەوشە. ـ گوێزەرەوە؛ گۆزەوە ‹بارگوێز› ☰ انتقال‌دهنده

**گوێزان**[1] / g(i)wêzan/: ☜ **گواستنەوە**

**گوێزان**[2]: ناو. گوویزان: ١. گۆزان؛ گووزان؛ گیزان؛ گێزان؛ چەقۆی مووتاشین؛ تیخی مووتاش ‹بە سەر دۆزەخا پردێ کێشراوە/ ئەڵێی گوێزانی تازە ساوراوە «قانع»› ٢. گوێزێن؛ وەزانی؛ یارییەکی چەن کەسی بە گوێز کە هەر کەس گوێزێک دادەنێ و بە نۆرە گوێزی بۆ دەخەن، هەر کەس بیانگێوێ، گوێزەکان هەڵدەگرێتەوە ☰ ١. استره؛ تیغ موتراشی ٢. گردوبازی

**گوێزانەوە** / g(i)wêzanewe/: چاوگ. تێپەڕ.تێنەپەڕ. //گوێزاتەوە؛ دەگوێزییەوە؛ بگوێزەوە// گوازتنەوە؛ گۆزینەوە؛ لە شوێنێ بۆ شوێنێ بردن یان چوون ☰ مُنتقل شدن/ کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەگوێزانەوە

**گوێزبەلە** / g(i)wêzbele/: ناو. گیایەکە ئەخورێ ☰ گیاهی خوردنی

**گوێزتن** / g(i)wêztin/: چاوگ. گوێستن؛ گوازتنەوە ☰ مُنتقل شدن

**گوێزتنـــــەوە / g(i)wêzt(i)newe/:** چـــــاوگ. گوێستنەوە؛ گوازتنەوە: ١. چوون لە شـوێنێکەوە بۆ شـوێنێکی تـر ٢. بـردن لـە جێگایەکـەوە بـۆ جێگایەکی تر ☰ ١. مُنتقل شدن ٢. مُنتقل کردن

**گوێزتـەکان / g(i)wêztekan/:** نـاو. گوێزتـەکانن؛ هەڕەتی گوێز تەکاندن ☰ موسم گردوچینی

**گوێزتەکانن / g(i)wêztekanin/:** ☜ **گوێزتەکان**

**گوێزر / g(i)wêzir/:** ناو. کوێزر؛ کۆزر ☰ کوزر

**گوێزرانـەوە / g(i)wêzranewe/:** چـاوگ. تێنەپـەڕ. نادیـار. //گوێزرایـەوە؛ دەگوێزرێـەوە؛ بگوێزرێـوە// گوازتنەوە؛ گۆزینەوە؛ لە شوێنێ بۆ شـوێنێ بـران ☰ مُنتقل شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: گوێزراوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەگوێزرانەوە

**گوێزک / g(i)wêzik/:** ☜ **گوێزنگ**

**گـوێزل / g(i)wêzil/:** ئاوەڵـناو. گـــوهرەپ ☰ بزرگ‌گوش

**گوێزلـک / g(i)wêzlik/:** نـاو. گۆزلـک؛ چاویلکـە؛ عەینەک ☰ عینک

**گوێزلەمە / g(i)wêzleme/:** ناو. شیرینی بە گوێز و شەکر دروستکراو ☰ شیرینی گردویی

**گوێزنگ / g(i)wêzing/:** نـاو. گـوێزک؛ گوێزینـگ؛ گۆزک؛ گۆزەک؛ گۆزەکـە؛ گۆزینـگ؛ گـووزەک؛ گوویزک؛ قولەفیسـکە؛ قولـەپێ؛ قولـەپا؛ قولەپـە؛ قولەپەی؛ قاپەڕەقە؛ چووە؛ قاپ؛ زەنگـە؛ زەنگـوو؛ زەنگۆل؛ زەنگی؛ قابگارە؛ قاپوورە؛ کاب؛ هوویرک؛ هەرکام لە دوو جمگـەی دەرپـەڕیوی دوو شـانی پاژنەی پێ و بنی لاق ☰ قوزک پا

**گوێزوو / g(i)wêzû/:** ناو. گوێزە؛ ئەو ئامرازە خڕەی کە شیشەچرا ڕادەگرێ ☰ حُباب چراغ

**گوێزە / g(i)wêze/:** نـاو. ١. ☜ **گوێزوو** ٢. *[کینایە، پلار]* کورتەبالای تەنگەستوور ☰ ١. ☜ **گوێزوو** ٢. آدم کوتاه‌قد شکم‌گُنده

**گوێزەبانە / g(i)wêzebane/:** ☜ **گوێزەوانە**

**گوێزەچەوەنـدەرە / g(i)wêzeçewendere/:** نـــاو. جۆرێک گوێزی دەنـک گـەورە ☰ نـوعی گـردوی درشت

**- گوێزەرەوە / g(i)wêzerewe-/:** پاشەوشە. ڕاگـوێزەر ‹ماڵ‌گوێزەرەوە› ☰ انتقال‌دهنده

**گـوێزەڕەش / g(i)wêzeřeş/:** نـاو. داری پەڵـک ☰ درخت ترنگوت

**گوێزەفەریکە / g(i)wêzeferîke/:** ناو. قەلاقووچکە؛ قەلاقووچە؛ کاکڵەگوێزی بە سـاخی دەرهـاتوو ☰ مغز گردوی درسته

**گوێزەکـوێرە / g(i)wêzek(i)wêre/:** نـاو. گـــوێزی پووچ ☰ گردوی پوک

**گوێزەگـــوێز / g(i)wêzeg(i)wêz/:** نـــاو. کــــاری گوازتنەوەی زۆر و لە دووی یەک ☰ نقل و انتقـال متوالی

**گـوێزەڵان / g(i)wêzełan/:** ناو. باغی دار گوێزان ☰ باغ درخت گردو

**گوێزەوان / g(i)wêzewan/:** ☜ **گوێزەوانە**

**گوێزەوانـە / g(i)wêzewane/:** نـاو. گوێزەبانـــە؛ گوێزەوان؛ گۆزەبانە: ١. میوانی بۆ منداڵـی سـاوا کە خودا بیکا لە زمان و گوێ بـێبـەش نـەبێ ٢. بازییەکی زارۆکانە ☰ ١. سـور تولـد نـوزاد بـە نیـت برخورداری او از نعمت گوش و زبان ٢. از بـازی‌هـای کودکانه

**گوێزهیند / g(i)wêzhînd/:** ناو. میوەیـەکی خـڕی زەلامـە دەورەی بـە پـرزە گـیراوە و شـیری لـە ناودایە ☰ نارگیل

**گوێزی[1] / g(i)wêzî/:** ناو. ڕەنگی ڕەشی ئامال سوور ☰ رنگ سیاه سُرخ‌فام

**گوێزی[2]:** ئاوەڵناو. بە ڕەنگی ڕەشی ئامـاڵ سـوورەوە ☰ سیاه سُرخ‌فام

**گوێزینگ / g(i)wêzîng/:** ☜ **گوێزنگ**

**گوێزێن** / g(i)wêzên/: ☜ **گوێزان**[٢]**ـ٢**

**گوێژ** / g(i)wêj/: ☜ **گوێژ**

**گوێستن** / g(i)wêstin/: ☜ **گوێزتن**

**گوێستنەوە** / g(i)wêst(i)newe/: ☜ **گوێزتنەوە**

**گوێسوانە** / g(i)wêswane/: ناو. گوێسەبانە؛ گۆسوانە؛ گێسوانە: ١. پاسارە؛ سوانە ‹ژیاوە گیانلەبەر دیسان لە کون هاتە دەرێ مێروو/ لە سەر گوێسوانە دەخوێنن بە پۆل پاساری و سێروو «هێمن»› ٢. ژێرتاق؛ ڕزنێک ئاجۆری سەر دیوار لە بن میچ یا بە دەوری درگاوە ☲ ١. لبەی بام ٢. گوشوار

**گوێسوک** / g(i)wêsûk/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی کەسێ کە زوو دەنگ دەبیسێ ☲ تیزگوش

**گوێسەبانە** / g(i)wêsebane/: ☜ **گوێسوانە**

**گوێشۆڕ** / g(i)wêşoř/: ئاوەڵناو. گۆهشۆڕ؛ گوێلەق: ١. گوێ داتەپیو ٢. *[کینایە]* خەجالەت؛ چاوشۆڕ ☲ ١. گوش فروهشتە ٢. شرمسار

**گوێفیل** / g(i)wêfîl/: ناو. گوێچکەفیل؛ گۆفیل؛ گۆش‌فیل؛ گۆش‌پیل: ١. گونەکەڵەبابە؛ گیایەک بە گەڵای درێژ و پانی وەک گوێی فیل و گوڵی بۆنخۆش و ڕیشەی گۆشتنەوە ٢. جۆرێ شیرینی ☲ ١و٢. گوش‌فیل

**گوێقوت** / g(i)wêqut/: ☜ **گۆبەل ـ١**

**گوێقوڵاخ** / g(i)wêquɫax/: ئاوەڵناو. گوێقوڵاغ؛ گوهکون؛ لەسەرهەست ☲ گوش‌بەزنگ

**گوێقوڵاغ** / g(i)wêquɫağ/: ☜ **گوێقوڵاخ**

**گوێقیت** / g(i)wêqît/: ☜ **گۆبەل ـ١**

**گوێکار** / g(i)wêkar/: ☜ **گوێبەرخۆڵە**

**گوێکپ** / g(i)wêkip/: ئاوەڵناو. کەڕ؛ نەبیس ☲ ناشنوا

**گوێکەت** / g(i)wêket/: ئاوەڵناو. گوێ ناتەواو ☲ ناقص‌گوش

**گوێکەرە** / g(i)wêkere/: ناو. گیاپەڕۆ ☲ گیاهی است

**گوێکەڕە** / g(i)wêkeře/: ناو. مێروویەکە لە هەزارپێ دەچێ و دەڵێن دەچێتە گوێچکەوە و دەبێتە هۆی کەڕی ☲ حشره‌ای مانند هزارپا

**گوێگر** / g(i)wêgir/: ناو. گوێدەر؛ گوێدێر؛ گوهدار؛ بیسەر؛ بیسەری قسەی قسەکەر ‹ئەی گوێگری ژیر و زیت و پیتۆل!/ پسپۆری وتەی بەنرخ و کرمۆل! «هەژار، *مەم و زین*»› ☲ شنونده

**گوێگران** / g(i)wêg(i)ran/: ئاوەڵناو. گوهگران؛ تایبەتمەندی کەسێ کە درەنگ دەبیسێ ☲ کم‌شنوا

**گوێگەزیزە** / g(i)wêgezîze/: ئاوەڵناو. خاوەن گوێچکەی خاڵ‌خاڵی ڕەش و سپی، وەک گوڵەگەزیزە (کاژیلە) ☲ گوش خالخالی (بزغاله)

**گوێل** / g(i)wêl/: ناو. ١. ☜ **گوێلە** ٢. گوێر؛ گوێروو؛ قولانج ٣. ☜ **گوێرەکە** ☲ ١. ☜ **گوێلە** ٢. باز؛ میان انگشت سبابه و ابهام ٣. ☜ **گوێرەکە**

**گوێلاندن** / g(i)wêlandin/: چاوگ. گوێرمێ کردن؛ بە دەست مێژاندنی گۆلک لە کاتی دۆشینی چێڵدا ☲ به تدریج گوساله را به مُک زدن پستان مادر آشنا کردن

**گوێلپار** / g(i)wêlpar/: ناو. گوێرەکەی دوو ساڵان ☲ گوساله‌ی دو ساله

**گوێلک** / g(i)wêlik/: ☜ **گوێرەکە**

**گوێلکەوان** / g(i)wêlkewan/: ناو. شوانی گوێرەکان ‹گوتم: کاکە! ئەگەر من لە تەرەغە [ئەو کابرایە] دە ڕۆژ لە بەرم بپاڕایەوە، نەمدەکردە گوێلکەوانی دێ، چونکە لاقی بیستانی دەشکاند! «هەژار، *چێشتی مجێور*»› ☲ گوساله‌چران

**گوێلم** / g(i)wêlim/: ☜ **گوێلە ـ٢**

**گوێلە** / g(i)wêle/: ناو. گوێل: ١. گرە؛ گوێر؛ گوێروو؛ گێر؛ کونی بەرداش ٢. گومش؛ گوێلم؛ گەمش؛ لاوێچ؛ پری لەپێکی دەست ☲ ١. سوراخ

سنگ آسیا ٢. پُر یک کف دست

**گوێلەق** / g(i)wêleq/: ئاوەڵناو. *[پلار]* ١. گوێ شۆڕ؛ گۆهشۆڕ ٢. *[کینایە]* کەر و نەفام ‹کەرە گوێلەق› ☰ ١. گوش فروهشته ٢. احمق

**گوێلەمست** / g(i)wêlemist/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* گوێ‌لەمشت؛ گوێڕایەڵ؛ ملکەچ و بەرفەرمان ☰ مُطیع و فرمانبردار

**گوێلەمشت** / g(i)wêlemişt/: ☜ **گوێ‌لەمست**

**گوێلەمە** / g(i)wêleme/: ☜ **گوێرمە**

**گوێلەوسار** / g(i)wêlewsar/: ☜ **گوێرەوسار**

**گوێماسیلکە** / g(i)wêmasîlke/: ☜ **گوێ‌ماسیلە**

**گوێماسیلە** / g(i)wêmasîle/: ناو. گوێش‌ماساو؛ گوهماسی؛ گوێ‌ماسیلکە؛ گوێچکەماسی؛ گۆماسی؛ لەپکە؛ گووشەلوو؛ قاپێلکی بڕێ گیانداری لەش‌نەرمی دەریایی کە لە داکشەی ئاودا، لە قەراخ چۆم و زەریاوە بە جێ دەمێنن ☰ گوش‌ماهی

**گوێمشکە** / g(i)wêmişke/: ناو. ١. گوهمشک؛ گیایەکە ٢. پەلکی تازەدەرکەوتوو ☰ ١. گیاهی است ٢. برگ تازه دمیده

**گوێمڵە** / g(i)wêm(i)łe/: ناو. گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ ☰ مرزنگوش

**گوێن** / g(i)wên/: ☜ **لەگوێن**

**گوێنۆ** / g(i)wêno/: ☜ **گوڵەبەرزانی**

**گوێنوو** / g(i)wênû/: ناو. ١. ☜ **گەون** ٢. ☜ **گۆنی[1]ـ١**

**گوێنە** / g(i)wêne/: ☜ **گەون**

**گوێ‌نەبیس** / g(i)wênebîs/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* بێ‌گوێ؛ سەرچەوت؛ سەرخەرلاسار؛ مەلەسە. هەروەها: **گوێ‌نەبیسی** ☰ حرف‌نشنو

**گوێ‌نەدەر** / g(i)wêneder/: ئاوەڵناو. ئاوەسوو؛ ولحێ؛ کەمتەرخەم. هەروەها: **گوێ‌نەدەری** ☰ سهل‌انگار؛ بی‌مبالات

**گوێ‌نەگر** / g(i)wênegir/: ئاوەڵناو. نەبیست؛ نەژنەوا؛ نەبیس؛ لاسار. هەروەها: **گوێ‌نەگری** ☰ لجباز

**گوێنی** / g(i)wênî/: ناو. ١. ☜ **گەون** ٢. ☜ **گۆنی[1]ـ١**

⊟ **گوێنی جەباری**: ☜ **گوێنیەزەردە**

**گوێنیکەزەردە** / g(i)wênîkezerde/: ناو. شەکرە؛ گوێنی جەباری ☰ گَوَن کتیرا

**گوێنیەڕەسە** / g(i)wên(i)yeřese/: ناو. جۆرێ درکە گوێنووی زۆر بڵندە، جەوی لێ‌دەگرن ☰ نوعی گَوَن سیاه

**گوێنیەڕەشە** / g(i)wên(i)yeřeşe/: ناو. ڕەشەگەون ☰ گَوَن سیاه

**گوێنیەزەردە** / g(i)wên(i)yezerde/: ناو. گوێنی جەباری؛ جۆرێ گوێنی زەردە کەتیرەی لێ دەگرن ☰ گَوَن کتیرا

**گۆ[1]** / go/: ناو. ١. ☜ **گوێ** ٢. تۆپی دارینی کاشۆبازی ٣. دوگمە؛ پشکۆژ ٤. هەست و پێ زانین و توانی جووڵاندنی ئەندام ‹تەمەڵ دەسی گۆ ئەکا، زوانی گۆ ناکا! «مەسەل»› ٥. چیچکی گوان و مەمک ‹گۆی مەمک› ٦. سەرەعاسای خڕ ٧. *[شوورەیی]* سەری کێر، ئەوەندی گۆشتی دیارە ٨. گا و چێڵ ٩. کۆ؛ پرایی خەڵک ١٠. سێلک؛ شەنەی سێ ددانە ١١. زمان؛ قسە؛ گفت؛ ڕەوتی قسە کردن ‹تاوانبار خۆی هاتە گۆ› ١٢. جۆرێ ئاوێزی ژنانە ‹سوخمەی نارنجی گۆ و دەڵەک پێوە/ لە ژێر سوخمەدا دوو شەکرەسێوە «قانع»› ☰ ١. ☜ **گوێ** ٢. گوی بازی ٣. دُکمه ۴. حس و توان حرکت اندام ۵. نُک پستان ۶. گوی سر عصا ٧. سر ذَکَر ٨. گاو ٩. انبوه مردم ١٠. افشون سه شاخه ١١. سُخن ١٢. نوعی آویز زنانه

⊟ **گۆ بردن**: ١. *[شوورەیی]* سەری سیرەت خستنە ناو زێوە ٢. گۆ لە کاشۆبازیدا ڕفاندن ☰ ١. سر

ذکر در فرج بردن ٢. گوی از میدان ربودن

**گۆ بردنەوە:** ١. سـەرکەوتن لـە کاشـۆبازیدا ٢. /کنایە/ پێش کەوتن لە هـەوالان ☰ ١. گـوی از میدان بە در بردن ٢. گوی سبقت ربودن

**گۆ چوون:** ☜ **لە گۆ چوون**

**گۆ کردن:** دەربـڕین؛ هێنانـە سـەر زار ☰ تلفـظ کردن

**گۆ نەکردن:** لە سەرمای زۆر یان تەزین، هەسـت پـێ نـەکردن و بـۆ نەهاتنـە جـووڵانی ئەنـدام ‹دەسـم گـۆ ناکـا بیگـرم› ☰ از شـدت سـرما یـا کرختی، حس نکردن و تکان نخوردن عضو

**لە گۆ بردن:** سڕ و بێهەست کردن لە سـەرمان ‹بەفرەکە دەسمی لە گۆ برد› ☰ کرخ و بـی‌حـس کردن

**لە گۆ بردنەوە:** بە ئاکاری ناشیرین یـان قسـەی تاڵ، کەسێک کە خەریکـە قسـەیەکی خـۆش دەکا، سـارد کردنـەوە ☰ سـخنران را از حـس و حال انداختن

**لە گۆ چوون:** گۆ چوون؛ سڕ بـوون لـە سـەرمان ‹دەسم لە گۆ چووە› ☰ کرخ و بی حس شدن

**لە گۆ خستن:** لە زمان خستن؛ لاڵ کردن ‹منـت کرد بە کەو، خۆت بە هەڵۆ/ من لە قەرەداغ، تۆ لـە زمنـاکۆ/ خـۆت لـوول دا هـاتی خسـتمت لـە گـۆ «فولکلۆر»› ☰ کرخ و بی حس کردن

**هاتنە گۆ:** هاتنە زمان؛ قسە کردن ☰ بـە سـخن آمدن

**گۆ**[٢]: ئاوەڵناو. گردیلەی چکۆلە ☰ گرد

**. گۆ**[٣]: پاشەوشە. وێژ ‹ڕاسگۆ› ☰ ـ گو؛ گوینده

**گۆ**[٤]: پێرۆ. ← **گفتوگۆ**

**گۆبـارە / gobare/:** نـاو. گاگـەل؛ ڕەوەی گـا و گامێش ☰ گلەی گاو و گاومیش

**گۆبازی / gobazî/:** ناو. گاڵتە و کایـەی کاشـۆبازی ☰ چوگان بازی

**گۆبەرۆک / goberok/:** ناو. ڕیزە دوگمەی زێڕ و زیو کە لە پێسیر دەدرێ ☰ گوی زینتی بر گریبان

**گۆبەل / gobel/:** ئاوەڵناو. گۆهبەل: ١. گـوێقیـت؛ گـوێقـوت ٢. /کنایـە/ لەسەرهەسـت ☰ ١. گوش‌برجستە ٢. تیزگوش

◻ **گۆبەل کردن:** /کنایە/ کوڵـە کـردن ☰ فـالگوش ایستادن

**گۆبەلـە / gobele/:** نـاو. گۆهبەلـە؛ بەلەباقـە ☰ از بیماری‌های بُز

**گۆبەن / goben/:** ☜ **گۆبەند**

**گۆبەند / gobend/:** نـاو. گۆبەن: ١. ڕستەی گـۆی خشڵ ٢. کۆ بوونەوە بۆ بەزم و شادی ٣. کێشە و ئاژاوە ‹گۆبەنـد نانـەوە› ☰ ١. گـوی‌بنـد گریبـان ٢. دورهمی برای سرور و شادی ٣. آشوب

◻ **گۆبەند گێڕان:** کـۆڕی بـەزم و ئاهـەنگ بـەڕێوە بردن ☰ خُنیاگری کردن

**گۆبەند نانەوە:** ئاژاوە نانەوە؛ فیتنە هەڵگرسان ☰ آشوب برپا کردن

**گۆبەندگێڕ / gobendgêř/:** ناو. ١. قامبێژی داوەت و بەزم ٢. /کنایە/ ئاژاوەچی ☰ ١. خُنیاگر ٢. آشوبگر

**گۆپار / gopar/:** ناو. گۆپارە؛ کۆپار ☰ چوگان؛ عصا

**گۆپارە / gopare/:** ☜ **گۆپار**

**گۆپاک / gopak/:** ئاوەڵناو. قسەجوان ☰ نیکوسخن

**گۆپال / gopal/:** نـاو. باکووڕە؛ گۆچان؛ داردەسـتی سەرچەمیو ☰ چوگان

**گۆپـاڵ / gopał/:** نـاو. ١. داردەسـتی ئەسـتوور ‹دەست دا بە گۆپاڵ پەرێ قەسـد جـەنگ/ شـانا نـە ڕووی فەرق شاهی زەردەهەنگ «*شانامەی کـوردی*، هەورامی»› ٢. داردەستی سەرچەماو ☰ ١. چُماق ٢. چوگان

**گۆپاڵبـاران / gopałbaran/:** نـاو. بـارانی زۆر بـە تەوژم و دەنک زل ‹دە وەرە سەیرێ، بە ڕۆژی مژ و گۆپاڵباران/ بارگـەیان پێکـەوە پێچـاوە، بـەرێ بـوون

یاران «هەژار/ هێمن»› ▪ رگبار شدید باران

**گۆپاڵزێوێن** / gopałzêwên/: ناو. ناوی وەزیـر لـە کایەی میرمیرێندا ▪ وزیر در بازی میر نوروزی

**گۆپک** / gopik/: ☜ **گۆپکە**

**گۆپکە** / gopke/: ناو. گۆپـک: ١. سەرچلـووی دار ٢. دوند؛ ترۆپکی چیا ٣. خونچەی شـکۆفەی دار ٤. نێرتکی هەندێ گیای وەکوو کەنگر ٥. سەری هەر شتێ درێـژ کـە خـڕ بـێ ٦. گژنیـژە؛ گـۆی مەمک ‹لێت ڕاهاتووم وەکوو مناڵ لە گۆپکـەی مـەم «پەشێو»› ▪ ١. بالاترین نقطـەی درخـت ٢. قُلـەی کوه ٣. تژەی درخت ۴. گردەی برخی گیاهان ۵. سر هر چیز بلند که گرد باشد ۶. نُک پستان

**گۆپۆ** / gopo/: ناوەڵناو. زەلامی زەبەلاح و ناقۆلا ▪ لندهور

**گۆپیتە** / gopîte/: نـاو. گۆپیلانک؛ تازە دەرهاتووی لک و گیا و سەوزە ▪ شاخه و گیاه تازه دمیده

**گۆپیلانک** / gopîlanik/: ☜ **گۆپیتە**

**گۆت**[١] / got/: ناو. ١. ڕەوتی بزووتن و جوولانەوە ٢. *[شـوورەیی]* کوت؛ حینچکە ▪ ١. تکان و جنبش ٢. کله در جماع

▣ **گۆت دان:** بزواندن؛ دەلەک دان ▪ تکان دادن

**گۆت لێدان** *[شوورەیی]* کوت پێوەدان ▪ کله زدن در جماع

**گۆت**[٢]: ناوەڵناو. گۆد؛ لەپێ کەوتوو لە بەر مانـدوویی ▪ بی‌حرکت از خستگی

▣ **گۆت بوون:** لەپێ کـەوتن لـە ڕێ ڕۆیشـتنی زۆر ‹گۆت بووم ئەوەندە ڕۆیشـتم› ▪ از پـا افتـادن از فرط خستگی

**گۆتـار** / gotar/: ناو. ١. گوتـار؛ وتـار ٢. *[شـوورەیی]* شەرمی سەربەمۆری کـچ ▪ ١. سـخنرانی ٢. آلـت تناسلی باکره

**گۆتـاڵ**[١] / gotał/: ناو. ١. شلـتاخ؛ دەبـە ٢. ئـاژاوە و پشێوی ٣. پاتاڵ و مالات ▪ ١. شلتاق ٢. آشوب ٣. دام (بجز بُز و گوسفند)

**گۆتاڵ**[٢]: ناوەڵناو. شووم و جووتقۆشە ▪ نحس

**گۆتاڵ**[٣]: پێرۆ. ← **گاوگۆتاڵ/ گرێ و گۆتاڵ**

**گۆتان** / gotan/: ناو. پەچە ▪ محل استراحت دام در صحرا

**گۆتاوەڕۆ** / gotaweřo/: ناو. کێشە و ئاژاوە؛ پشێوی ▪ آشوب

**گۆتر** / gotir/: ☜ **کۆتر**[١]

**گۆترگـە** / gotirge/: نـاو. گیایـــەکی لاســـک ئەستووری سەر پڕ لە دڕکە ▪ گیاهی خاردار

**گۆترمە** / gotirme/: ☜ **گۆترە**

**گۆترە**[١] / gotre/: گۆترمە ↓

▣ **بە گۆترە:** بە بڕە ‹تووەکەت بە گۆترە چەند؟› ▪ سرجمع

**گـۆترە**[٢]: ناوەڵـناو. گۆترمــە؛ نــەگونجاو؛ گەوجانــە ‹کاکت کاری گۆترە زۆر دەکا› ▪ نسنجیده

**گۆترە**[٣]: ناوەڵکار. گۆترمە؛ بێ تێڕامان و لێکدانـەوە ‹گـۆترە خـۆت مەکوتـە نێـو قسـەی خەڵـکدا!› ▪ بی‌مُطالعه

▣ **بە گۆترە:** بە بێ کێشـانە و پێوانـە ‹بـە گـۆترە سەندم› ▪ فلّه‌ای

**گۆترەکاری** / gotrekarî/: ناو. *[کینایە]* هەڕەمەکاری؛ کاری بیر لێ‌نەکراوە ▪ کار نسنجیده

**گۆترەکان** / got(i)rekan/: ناو. گۆترەکێن؛ هەڕەتی دەم کردنەوەی خونچـەی دار ▪ موسـم سـر بـاز کردن شکوفه

**گۆترەکێن** / got(i)rekên/: ☜ **گۆترەکان**

**گۆترەیی** / gotreyî/: ناوەڵناو. ڕەمـەکی؛ هـەرەکی؛ هەیکۆ ▪ رمکی

**گۆتن** / gotin/: ☜ **گوتن**

**گۆتە** / gote/: ناو. ١. ☜ **گوتـە١** ٢. ☜ **گۆتەکە**

**گۆتەکە** / goteke/: نـاو. گۆتە؛ کەوشەک؛ دایلەرێ؛ کایەی حەمزەل ▪ جُفتک‌چارکش

**گۆتەگۆت** / gotegot/: ☜ **گوتە ـ٢**

**گۆتەنی** / gotenî/: ☜ **گوتەنی**

**گۆج** / goc/: ئاوەڵناو. چەفت و چەوێڵ (دەست و پا) ☰ ناقص (دست و پا)

**گۆجاگ** / gocag/: ناو. بشکۆک؛ قۆبچە؛ دوگمە ☰ دُکمه

**گۆجک** / gocik/: ناو. جاش‌باڵتە؛ پاڵتۆی تاپشت ئەژنۆ ☰ پالتوی کوتاه

**گۆجە** / goce/: ناو. بەندی بەرۆک ☰ بند یقه

**گۆجی** / gocî/: ناو. ١. گوچ؛ ژەک؛ یەکەم شیر ٢. گۆچی؛ چەوێلی (دەست و پا) ☰ ١. آغوز ٢. نُقصان (دست و پا)

**گۆچ**[1] / goç/: ناو. کاری لەش بە چەوری یان هەر شتێ داماڵین ☰ کار چربی یا دیگر مواد را بە تن مالیدن

⊡ **گۆچ کردن**: ١. ئەندامی زارۆ بە ڕۆن چەور کردن و داماڵین ٢. فرچ دان؛ ژەک دان بە ساوا ☰ ١. تن نوزاد را به روغن اندودن و ماساژ دادن ٢. آغوز دادن به نوزاد

**گۆچ**[2]: ئاوەڵناو. خووگرتوو؛ ڕاهاتوو؛ هۆکارە ‹منێ کە گۆچی تاوی گەرمی بەردەوارەکەی عەشیرەتم/ بە دارە تەرمی کووچەکانی شارەکەت/ ڕانەهاتووە لەشم «سوارە»› ☰ مأنوس

**گۆچان** / goçan/: ناو. گۆچانە: ١. گۆچەل؛ گۆپار؛ شاکۆن؛ داردەستی سەرچەماو ٢. گۆپاڵ؛ کۆپال ☰ ١. چوگان؛ عصا ٢. چُماق سرگنده

**گۆچانقەند** / goçanqend/: ناو. ئەتلەسی ☰ اطلسی

**گۆچانە** / goçane/: ☜ **گۆچان**

**گۆچک** / goçik/: ☜ **گوێ**

**گۆچەری** / goçerî/: ناو. کۆچەری؛ خێلاتی؛ ڕەوەند ☰ کوچ کننده به ییلاق

**گۆچەل** / goçel/: ناو. گۆپاڵ؛ گۆچان ☰ عصا

**گۆچەوەن** / goçewen/: ناو. شووژن؛ سووژن ☰ جوالدوز

**گۆچی** / goçî/: ☜ **گۆجی ـ٢**

**گۆخڵ** / goxił/: ناو. وەرزا؛ زانا لە چەڵتووک چاندندا ‹لە بەر خاتری تۆ خۆم کرد بە گۆخل/ شێلام زیخ و چەو، درک و پەیکول «فولکلۆر»› ☰ خُبرەی شالیکاری

**گۆخلانە** / goxłane/: ناو. کرێی زانا و پسپۆری برنجەجاڕ ☰ مُزد آدم خُبره در شالیکاری

**گۆد** / god/: ☜ **گۆت**[2]

**گۆداری** / godarî/: ☜ **گوێداری ـ١**

**گۆدلە** / godle/: ناو. کاکۆلی سەر هەنیە ☰ کاکُل روی پیشانی

**گۆدە** / gode/: ناو. گۆڤدە؛ لەش؛ قەوارە ☰ جسم؛ بُنیه

**گۆدەک** / godek/: ناو. پیزە؛ تۆڵ؛ پز؛ پس ☰ جنین

**گۆدەگۆد** / godegod/: ناو. ڕەوتی سەر ڕاژاندنی منداڵ ☰ فرایند سر تکان دادن کودک

**گۆدەڵە** / godełe/: ناو. گۆدەڵەکە؛ خشڵێ کە بە کەنارەی کولەچەوە دەدروێ ☰ زیور کنارەی یلک

**گۆدەڵەکە** / godełeke/: ☜ **گۆدەڵە**

**گۆر** / gor/: ئامراز. وەک؛ چەشن؛ لەوێنە؛ جۆر ☰ مانند؛ طور

**گۆران** / goran/: ناو. ١. تیرەیەکی گەورە لە کورد ٢. دێهاتی؛ ڕەعیەتی خەلکی دێ ٣. ڕێگر؛ چەتە ٤. لەوەڕگە ☰ ١. طایفەی بزرگی از کردها ٢. دهاتی ٣. راهزن ۴. مرتع

**گۆرانگە** / gorange/: ناو. ١. پاوانی داری دارستان بۆ کەسێک ٢. جێگەی ڕێگران ☰ ١. درختان قُرُق شدەی جنگل ٢. مقر راهزنان

**گۆرانی**[1] / goranî/: ناو. ١. قام و بەستە ‹بەژن و بالاکەت نموونەی هەیکەلی یۆنانییە/ لارولەنجەت مۆسیقایە، بەستەیە، گۆرانییە «هەردی»› ٢.

شێوەزاری لقی گۆران ☰ ١. ترانە ٢. گویش گورانی
▣ **گۆرانی چڕین:** ☜ **گۆرانی گوتن**
**گۆرانی خوێن:** ☜ **گۆرانی گوتن**
**گۆرانی کوتن:** ☜ **گۆرانی گوتن**
**گۆرانی گوتن:** گۆرانی کوتن/ گۆتن/ وتن/ چڕین/ خوێن؛ قام خوێندن ☰ ترانە خواندن
**گۆرانی گۆتن:** ☜ **گۆرانی گوتن**
**گۆرانی وتن:** ☜ **گۆرانی گوتن**

**گۆرانی**[٢]: ئاوەڵناو. ١. سەر بە ناوچە و مەڵبەندی گۆران ٢. پێوەندیدار بە زمان، فەرهەنگ و وێژە و خەڵکی گۆرانەوە ☰ ١و٢. گورانی

**گۆرانیبێژ** / goranîbêj/: ناو. گۆرانیوێژ؛ گۆرانیچڕ؛ قامبێژ؛ دەنگبێژ ☰ خوانندە؛ ترانە خوان

**گۆرانیچڕ** / goranîçiř/: ☜ **گۆرانیبێژ**

**گۆرانیزان** / goranîzan/: ناو. شارەزای قام و بەستەی زۆر ☰ اُستاد آواز

**گۆرت** / gort/: ناو. ١. لێژایی؛ بەرەوژێرە؛ سەرەولێژایی ٢. بناری چیا ☰ ١. سراشیبی ٢. دامنەی کوه

**گۆرتە** / gorte/: ناو. کەڵلا؛ هەڵماتی گەورە ☰ تیلەی بزرگ

**گۆرتێن** / gortên/: ناو. جۆشقان؛ گۆرتە؛ جۆرێک مێشێن بە هەڵماتی زۆر گەورە ☰ نوعی تیلەبازی با تیلەی بسیار بزرگ

**گۆرد**[١] / gord/: ناو. شیر؛ شمشێر ☰ شمشیر

**گۆرد**[٢]: ئاوەڵناو. ژەنگاوی و کول (شیر و خەنجەر) ☰ کُند و زنگ‌زدە (شمشیر و خنجر)

**گۆردە** / gorde/: ئاوەڵناو. ١. گوێ پان و شۆڕ (بزن) ٢. *[کنایە]* بێغیرەت و تەرەس ☰ ١. دارای گوش پهن و دراز (بز) ٢. بی‌غیرت و دیّوث

**گۆرژاڵ** / gorjal/: ناو. بەن‌سامۆرتە؛ بەن‌سامۆتە ☰ فتراک

**گۆرم** / gorm/: ناو. ١. ژن‌خوشک؛ خۆشکی ژن ٢. دوش؛ خۆشکی مێرد ☰ ١. خواهرزن ٢. خواهرشوهر

**گۆرمار** / gormar/: ناو. کۆرەمار ☰ مارسام

**گۆرمز** / gormiz/: ناو. بزە؛ زەردەخەنە ☰ لبخند

**گۆرمزە** / gorm(i)ze/: ناو. خەردەلی کێوی؛ گیایەکی خۆراکی وەک ئەسپەناخە ☰ خردل کوهی

**گۆرمزین** / gorm(i)zîn/: چاوگ. بزە هاتنە سەر لێوان ☰ لبخند بر لب آمدن

**گۆروا** / gorwa/: ☜ **گۆرەوی**

**گۆروابازی** / gorwabazî/: ☜ **گۆرەوی‌بازی**

**گۆرواباف** / gorwabaf/: ناو. ١. ☜ **گۆرواچن** ٢. ☜ **گۆرەوی‌چنە**

**گۆرواچن** / gorwaçin/: ناو. گۆرواباف: ١. کەسێ کە گۆروا دەچنێ ٢. باڵدارێکی زۆر پچووکە ☰ ١. جوراب‌باف ٢. پرندەای بسیار کوچک

**گۆرواسە** / gorwase/: ناو. گورواسە؛ گورگاسە؛ پشیلەکێوی ☰ گربەی وحشی

**گۆرۆز** / goroz/: ناو. تۆمار؛ نووسراوی لوول‌دراو ☰ طومار

**گۆرە**[١] / gore/: ناو. ١. ☜ **گۆرەوی** ٢. ☜ **گوێرەکە** ٣. ئەندازە؛ ڕادە ☰ ١. ☜ **گۆرەوی** ٢. ☜ **گوێرەکە** ٣. اندازە

**گۆرە**[٢]: ئاوەڵناو. لە کارزان ☰ کاردان

**گۆرە**[٣]: ← **لەگۆرە**

**گۆرەبا**[١] / goreba/: ناو. گۆرە؛ ئەندازە ☰ اندازە

**گۆرەبا**[٢]: ئامراز. لە وێنە؛ وەک؛ لە چەشن ☰ مثل؛ مانند

**گۆرەکڵە** / goreklە/: ناو. گووری چکۆڵە؛ بێچووە چێلی تازەزاو ☰ گوسالەی نوزاد

**گۆرەکە** / goreke/: ☜ **گوێرەکە**

**گۆرەنیش** / gorenîş/: ناو. گۆرت؛ سەربەرەخوارە؛ لێژی؛ سەرەژێرە ☰ سراشیبی

**گۆرەوا** / gorewa/: ☜ **گۆرەوی**

**گۆرەوی** / gorewî/: ناو. گورمی؛ گـورمین؛ گـۆروا؛ گۆرە؛ گـۆرەوا؛ گۆریـە؛ گـۆرەویێ؛ گـۆری؛ گۆیـە؛ گوورە؛ جۆراو؛ جووراو؛ جۆراب؛ کورک؛ پۆشەنێکی چندراوە کە دە پا دەکرێ و لانیکەم لە پەنجەوە هەتا ژوور قاپوولە دادەپۆشێ ☰ جوراب

**گۆرەویبـازی** / gorewîbazî/: نـاو. گۆروابـــازی؛ گۆرەیبازی؛ جۆرابێن؛ جۆراوێن ☰ جوراببازی

**گۆرەویچنـە** / gorewîç(i)ne/: نـاو. گۆروابـــاف؛ گۆرەویلـە؛ گۆریەچنـە؛ دوکەریسـە؛ دوکەرێسـە؛ گۆرێچنە؛ تۆرەمە باڵندەیەکی بچووکن، لـە سـەر داران دەژین، زۆر لە هاتوچـۆدان، دەنـدووک و لاقیان بەهێزە، زستانان بـە گـەڵ دەژیـن، چـەن جۆریان هەیە: پاش مل سپی، شێ، تورکسـتانی، سمێڵدار، شین و... ☰ چرخریسک

**گۆرەویلە** / gorewîle/: ☜ **گۆرەویچنە**

**گۆرەویێ** / gorewê/: ☜ **گۆرەوی**

**گـۆرەویێبـازی** / gorewêbazî/: نـاو. گۆروابـــازی؛ پشکیلان ☰ جوراببازی

**گۆرەیبازی** / goreybazî/: ☜ **گۆرەویبازی**

**گۆری** / gorî/: ناو. ١. گوهری؛ قوربان ‹ئـەز گـۆری هەر دوو چاڤـێن تـە بـبم› ٢. ☜ **گـۆرەوی** ☰ ١. قُربان؛ فدایی ٢. ☜ **گۆرەوی**

⊡ **گۆری بـوون**: بە قوربان بوون؛ دە سەر گـەڕان ☰ قربان رفتن

**گۆری کرن**: بە قوربان کردن ☰ فدا کردن

**گۆریـان** / goryan/: چاوگ. هـۆنین؛ هۆندنـەوە ☰ ریسیدن

**گۆریاییش** / goryayîş/: چاوگ. ١. کـار کـردن ٢. نۆکەری کردن ☰ ١. کار کردن ٢. نوکری کردن

**گۆرین** / gorîn/: جێناو. گۆیین: ١. ئەو شتە کـە ٢. کاوراکە ☰ ١. فلان چیز ٢. فلان کس

**گۆریە** / gorye/: ☜ **گۆرەوی**

**گۆریەچنە** / goryeç(i)ne/: ☜ **گۆرەویچنە**

**گۆرێچنە** / gorêç(i)ne/: ☜ **گۆرەویچنە**

**گـۆڕ**[1] / gor̄/: ناو. ١. گۆڕن؛ گۆڕخانە؛ گڵـکۆ؛ قـەبر؛ قەبرە؛ قەور؛ دەخمە؛ گەهەر؛ تا؛ ترب؛ ترپ؛ تـەو؛ چاڵی مردوو تێناشتن ‹بارام کە هەموو ژیانی خۆی گۆڕی دەگرت/ دیتـت بـە چ جـۆرێ گـۆڕێ بـارامی گرت؟! «هەژار، *چوارینەکانی خەیام*»› ٢. خەرگۆڕ؛ کەرەکێوی ‹بارام کـە هـەموو ژیـانی خـۆی گـۆڕی دەگرت/ دیتت بە چ جـۆرێ گـۆڕێ بـارامی گـرت؟! «هەژار، *چوارینـەکانی خـەیام*»› ٣. گـوارا؛ نـۆش؛ ڕەوان ٤. ئـارا؛ بـەردەم ‹قسـەکەم خسـتە گـۆڕێ؛ سێوەکانی لەو گۆڕە ڕۆ کرد› ☰ ١. گور ٢. گـورخر ٣. گوارا ۴. صحنەی مجلس

⊡ **گۆڕ زرینگاندنەوە**: گـۆڕ هـەڵاخنین؛ جنێـو بـە مردوو دان ‹دەمی بەر بوو لێمـان، گـۆڕی هـەموو مردووەمانی زرینگاندەوە!› ☰ مُردە را دُشنام دادن

**گۆڕ گوم بوون**: *[پلار]* ون بوون و تەنانەت نـەمانی ناو نیشان. هەروەها: **گۆڕ گوم کردن** ☰ گُموگور شدن

**گۆڕ هەڵاخنین**: ☜ **گۆڕ زرینگاندنەوە**

**گۆڕ هەڵبەستن**: سەری قەبر بـە خشـت و قسـڵ دابەستن ☰ سنگ و خشت بر گور گذاشتن

**گۆڕی گیان بوون**: *[پلار]* بە نۆشی گیان بـوون ‹دە ئۆباڵ بەستۆم حەج وا دەبێ! با عـارەبی پێخواسـی بێدەرپێ، لە ناو خۆڵدا بگـەوزن، گـۆڕی گیانیانـە! «هەژار، *چێشتی مجێور*»› ☰ گوارای وجود بودن

**لە گۆڕدا بـوون**: لە ئارادا بـوون ‹هـەڵومـەرجێکی نهێنی ئەوتۆ لە گۆڕێـدا بـوو کـە پـێڕانەگەیشـتم هیچـی بـۆ بنووسـم [بـۆ ڕۆژنامـەی *کوردسـتان*] «هێمن»› ☰ در جریان بودن؛ در میان بودن

**گۆڕ**[2]: ناوەڵناو. تەخت و ڕاست ☰ هموار

**- گۆڕ**[3]: پاشەوشە. بگۆڕ ‹خۆگۆڕ› ☰ تغییردهندە

**گۆڕ**[4]: پێرۆ. ← **ناڵوگۆڕ**

**گۆڕان**[1] / gořan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //گۆڕای؛ دەگۆڕێی؛ بگۆڕێ// گۆڕیان؛ بارەوبار بوون؛ لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی‌تر چوون ≡ تغییر کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: گۆڕاو/ چاوگی نەرێنی: نەگۆڕان

**گۆڕان**[2]: ناو. گوهار؛ ئاڵوگۆڕی ‹ئەندامەتی کۆمەڵەی «ژ.ک» گۆڕانێکی سەیری بە سەر مندا هێنا «هێمن»› ≡ تغییر

**گۆڕاندن** / gořandin/: چاوگ. هیلاندن؛ حیلە کردن؛ هیرین ≡ شیهه کشیدن

**گۆڕاننەوە** / gořannewe/: چاوگ. گۆڕینەوە؛ شتێ لە بەرانبەر شتێکا دان ≡ مُعاوضه کردن

**گۆڕانەوە** / gořanewe/: چاوگ. تێنەپەڕ. //گۆڕایەوە؛ دەگۆڕێیەوە؛ بگۆڕێوە// ١. گۆڕیانەوە؛ درانی شتێ لە بەرانبەر شتێکا ٢. گۆڕینەوە؛ دانی شتێ لە بەرانبەر شتێکا ≡ ١. مُعاوضه شدن ٢. مُعاوضه کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: گۆڕاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەگۆڕانەوە

**گۆڕاو** / gořaw/: ئاوەڵناو. گۆڕیاگ؛ لە بارێکەوە بۆ بارێکی‌تر چوو ≡ تغییریافته

**گۆڕایی** / gořayî/: ئاوەڵناو. دەشتایی؛ تەختان ≡ زمین هموار

**گۆڕبەگۆڕ** / gořbegoř/: ئاوەڵناو. گۆڕوەگۆڕ؛ گۆڕەوگۆڕ (جنێوێکە) ‹سەددامی گۆڕبەگۆڕ› ≡ گوربه‌گور

**گۆڕپشکنەک** / gořpişk(i)nek/: ☜ **گۆڕکەنە**

**گۆڕخانە** / gořxane/: ناو. ١. قەبر ٢. ☜ **گۆڕستان** ≡ ١. قبر ٢. ☜ **گۆڕستان**

**گۆڕدران** / gořd(i)ran/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //گۆڕدرای؛ دەگۆڕدرێی؛ بگۆڕدرێ// گۆڕان؛ گۆڕیان ≡ عوض شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: گۆڕدراو/ چاوگی نەرێنی: نەگۆڕدران

**گۆڕسان** / gořsan/: ☜ **گۆڕستان**

**گۆڕستان** / gořistan/: ناو. گۆڕخانە؛ گۆڕسان؛ سەرقەبران؛ زیارەتان ≡ قبرستان

**گۆڕغەریب** / gořğerîb/: ئاوەڵناو. مردوو لە ئاوارەییدا ≡ در غربت مُرده

**گۆڕک** / gořik/: ناو. گۆڕکە: ١. تەختایی مەجلیس ٢. ئاگردانی کۆڕ ≡ ١. صحن مجلس ٢. آتشدان مجلس

**گۆڕکۆڵ** / gořkoł/: ☜ **گۆڕهەڵکەن**

**گۆڕکە** / gořke/: ☜ **گۆڕک**

**گۆڕکەن** / gořken/: ناو. ١. ☜ **گۆڕکەنە** ٢. گۆڕهەڵکەن؛ ئەو کەسە کاری کەندنی گۆڕە ‹ترسم هەیە گرێ لە دڵم شی نەبێتەوە/ تا گۆڕکەنم نەکاتەوە ڕۆژێ گرێی دەزوو «شێخ جەلال»› ≡ ١. ☜ **گۆڕکەنە** ٢. گورکن (شخص)

**گۆڕکەنک** / gořkenik/: ☜ **گۆڕکەنە**

**گۆڕکەنکە** / gořkenke/: ☜ **گۆڕکەنە**

**گۆڕکەنە** / gořkene/: ناو. گۆڕپشکنەک؛ گۆڕکەن؛ گۆڕکەنکە؛ گۆڕهەڵکەنە؛ گۆڕنەباش؛ گۆڕەوکەنە؛ گۆڕکەنک؛ گوورکەنەک؛ گوورشپنەک؛ قەورپشکنەک؛ قورەبەشە؛ کورەبەش؛ کورەبەشک؛ کورەبەشەک؛ کورەبەشە؛ کوربەشک؛ چوالو؛ چالو؛ چوالوو؛ چوارلۆ؛ چالگ؛ چالک؛ چالە؛ چالەک؛ چارکە؛ چالەکە؛ چالاکە؛ تژی؛ قەورکەنەک؛ قەورکەنە؛ بەتکریەش؛ بەتکەبەش؛ وشەک؛ گیانەوەری گواندار‌ی شەوگەڕ بە لەشێکی پان و پڕ و قورس، قەپۆزی بارێک، چنگ و پەلی تیژ و تیسکی درێژی خۆلەمێشییەوە، زەوی هەڵدەکۆڵێ و مێروو دەخوا، لە مووەکەی بۆ دروستکردنی فڵچە کەڵک وەردەگرن ≡ گورکن

**گۆڕمچە** / gořm(i)çe/: ☜ **گورمچه**

**گۆڕن / gořin/:** ☜ **گۆڕ١-١**

**گۆڕنەباش / gořnebaş/:** ناو. ١. کەمتیار ٢. ☜ **گۆڕکەنە** ≡ ١. کفتار ٢. ☜ **گۆڕکەنە**

**گۆڕوەگۆڕ / gořwegoř/:** ☜ **گۆڕبەگۆڕ**

**گۆڕەپان / gořepan/:** ناو. ١. تەختایی زەوی ‹بۆت نووسیوم بۆت بنووسم ئەمن چیم/ دونـدی قەنـدیل، گۆڕەپانـی هەڵـگورد نـیم «هـێمن»› ٢. مەیـدان؛ مەیان ≡ ١. زمین هموار ٢. میدان

**گۆڕەڤان / gořevan/:** ☜ **گۆڕەوان**

**گۆڕەمەرگی١ / gořemergî/:** نـاو. *[کنایە]* گۆڕەومەرگی؛ ڕەوتی تا مردن کار کردن ‹شێخاڵە کەچەڵ بە گۆڕەمەرگی، یانی تا مـردن بۆیـان بچێتـە بەر مەڕی ... «توحفە»› ≡ حالت تـا دم مـرگ کـار کردن

**گۆڕەمەرگی٢:** ئاوەڵناو. گۆڕەومـەرگی؛ هەتاهـەتایی ‹بەناکە ماڵێکی گۆڕەمەرگی کردۆتەوە› ≡ همیشگی

**گۆڕەمەرگی٣:** ئاوەڵکار. گۆڕەومەرگی؛ تاهەتایی؛ بـۆ هەمیشە ‹ئەم بەنایە هەر گۆڕەمەرگی ماڵ ئەکاتەوە› ≡ عُمری

**گـۆڕەوان / gořewan/:** نـاو. گۆڕەڤـان؛ زێـدەوان؛ زێوەوان ≡ نگهبان گورستان

**گۆڕەوشـار / gořewşar/:** ناو. ١. شکەنجە و ئـازاری ناو قەبر بۆ مردوو ٢. *[مەجاز]* دەرد و ئازاری زۆر ≡ ١. شکنجەی مرده در گور ٢. رنج و مشقّت بسیار

⊡ **گۆڕەوشـار دان:** *[کنایە]* ئەشـکەنجە کـردن ≡ شکنجه کردن

**گۆڕەوکەنە / gořewkene/:** ☜ **گۆڕکەنە**

**گۆڕەوگۆڕ / gořwegoř/:** ☜ **گۆڕبەگۆڕ**

**گۆڕەومەرگی / gořewmergî/:** ☜ **گۆڕەمەرگی**

**- گۆڕەوە / -gořewe/:** پاشەوشە. ئەوەی دەگۆڕێتەوە ‹ڕێ‌گۆڕەوە› ≡ مُعاوضه کننده

**گۆڕەهـو / gořehû/:** ئاوەڵـناو. بـێ‌سـەر و شـوێن (مـردوو) ‹مـردووە، بـەلام کـەس نازانـێ لـە کـوێ گۆڕەهوو بووە› ≡ گمنام و بی‌مزار

**گۆڕهـەڵتەکێنـە / gořheŀtekêne/:** نـاو. *[پـلار]* وشەیەکە لە دووی مردوویەکی دەڵێن کە میراتی زۆرە و کـوڕی نییـە ≡ اصـطلاح ویـژەی مُـردەای ثروتمند که پسر ندارد

**گۆڕهەڵکەن / gořheŀken/:** ناو. گۆڕکـۆڵ؛ کەسـێ کە پیشەی قەبر کۆڵینە ‹گۆڕهەڵـکەنیش ئەنرێتـە گۆڕ «مەسەل»› ≡ آدم گورکن

**گۆڕهەڵکەنە / gořheŀkene/:** ☜ **گۆڕکەنە**

**گۆڕی / gořî/:** ناو. سەرگەرد ≡ فدا؛ قربان

**گۆڕیاگ / gořyag/:** ☜ **گۆڕاو**

**گۆڕیان / gořyan/:** ☜ **گۆڕان١**

**گۆڕیانەوە / gořyanewe/:** ☜ **گۆڕانەوە ١-**

**گۆڕیچە / gořîçe/:** ناو. ئەلحەد؛ بنی قەبر کە تەنگ دەبێتەوە و مردووی تێ دەنێن ≡ لحد

**گـۆڕین / gořîn/:** چاوگ. تێـەڕ. //گۆڕیـت؛ دەگـۆڕێ؛ بگـۆڕە// ١. شـتێ لـە جێگـەی شـتێ کـردن ‹ماڵەکەت گۆڕی؟› ٢. جلک داکەندن بۆ شتن ٣. گـۆڕان؛ بـە شـێوازیتـر دەرهێنـان ‹ڕێگەکـەمان گـۆڕی، خسـتمانە ئـەولاتر› ٤. تێنەپـەڕ. نەڕانـدن؛ بۆڕاندن ≡ ١. عوض کردن ٢. لباس بـرای شستشـو عوض کردن ٣. تغییر دادن ٤. غُریدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: -/ چاوگی نەرێنی: نەگۆڕین

**گۆڕینەوە / gořînewe/:** چـاوگ. تێـەڕ. //گۆڕیتـەوە؛ دەگۆڕییـەوە؛ بگـۆڕەوە// ١. شـت بـە شـت دان ‹گۆڕینەوەی ماڵ› ٢. پووڵ ورد کردنەوە ٣. پارەی وڵاتێ دان و هی وڵاتێکیتر ساندن ٤. دیسـانەوە گۆڕین ≡ ١. مُعاوضه کردن ٢. پـول خُـرد کـردن ٣. تبدیل کردن ارز؛ پول کشوری را با پول کشـور دیگـر مُبادله کردن ٤. دوباره عوض کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: -/ چاوگی نەرێنی: نەگۆڕینەوە

**گۆز١ / goz/:** ناو. ١. گـوێز ٢. گـۆزە ≡ ١. گـردو ٢. کوزه

ـ **گۆز**[٢]: پاشەوشە. ـ گـوێز؛ ـ گـوێزەرەوە؛ گـۆزەوە ⇐ انتقال‌دهنده

**گۆز**[٣]: پێرۆ. ← **ئازوگۆز**

**گـۆزاچِخ / gozaçix**/: ئاوەڵـناو. ١. چــاوکراوە ٢. فێڵباز ⇐ ١. آگاه ٢. مکّار

**گـۆزان**[١] **/ gozan**/: ناو. ١. ☜ **گوێزان**[٢]**ـ١** ٢. کاری سەر ڕاوەشاندنی زارۆک ٣. ئاگاداری؛ چاوەدێری؛ چاڤێری ⇐ ١. ☜ **گوێزان**[٢]**ـ١** ٢. عمل سر تکـان دادن کودک ٣. مُراقبت

**گۆزان**[٢]: ئاوەڵناو. پڕاوپڕ؛ دارماڵ؛ تژە ⇐ پُر؛ لبالب

**گۆزانـدن / gozandin**/: چـاوگ. ١. پــڕ کــردن؛ دارماڵ کـردن ٢. لاواندنـەوەی منـداڵ ⇐ ١. پُر کردن ٢. نوازش کردن کودک

**گۆزاندنــــەوە / gozand(i)newe**/: چـــــاوگ. ڤەکۆچاندن؛ ڕەو پێ کردن؛ ماڵەوماڵ پێ کـردن ⇐ کوچ دادن

**گـۆزان‌ـگـۆزان / gozan gozan**/: نـاو. کـاری سـەر ڕاوەشاندنی زارۆک ⇐ عمل سر تکان دادن بچـه از شادی

**گـۆزانن / gozanin**/: چـاوگ. ١. پـڕ کـردن؛ تـژە کردن ٢. ☜ **گواستنەوە** ٣. ئاگـاداری کـردن ٤. بە تەوژم لێدان ⇐ ١. پُر کردن ٢. ☜ **گواسـتنەوە** ٣. نگهداری کردن ۴. ضربت زدن

**گۆزاننەوە / gozannewe**/: ☜ **گواستنەوە**

**گۆزانەوە / gozanewe**/: چاوگ. ١. ☜ **گۆزینـەوە** ٢. گواستنەوە؛ بردنی بـووک بـۆ ماڵـی زاوا ⇐ ١. ☜ **گۆزینەوە** ٢. بُردن عروس به خانەی داماد

**گۆزاو / gozaw**/: ئاوەڵـناو. گـۆزراو؛ لـە شـوێنێ بـۆ شۆێنێ‌تر براو ⇐ انتقال داده شده

**گۆزاوڵـە / gozawłe**/: ناو. پۆرگی سـەر پێسـت ⇐ تاول

**گۆزتن / goztin**/: ☜ **گواستنەوە**

**گۆزتنەوە / gozt(i)newe**/: ☜ **گواستنەوە**

**گـۆزران / gozran**/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیـار. //گـۆزرای؛ دەگۆزرێی؛ بگۆزرێ// جێبـەجێ کـران ⇐ جابـەجا شدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: گـۆزراو/ چـاوگی نـەرێنی: نەگۆزران

**گۆزراو / gozraw**/: ☜ **گۆزاو**

**گۆزروان / gozirwan**/: ☜ **گادەمە**

**گۆزک / gozik**/: ناو. ١. ☜ **گۆزەڵـە** ٢. قۆزاخـەی پەمۆ ٣. ☜ **گوێزنگ** ⇐ ١. ☜ **گۆزەڵـە** ٢. غـوزە ٣. ☜ **گوێزنگ**

**گۆزکە / gozke**/: ☜ **گۆزەڵە**

**گۆزلک / gozlik**/: ☜ **گوێزلك**

**گۆزنای / goznay**/: چاوگ. گەوزاندن ⇐ غلتاندن

**گـۆزنگرێ / gozing(i)rê**/: نـاو. ١. گــرێ‌کــوێرە؛ گرێ‌کۆرە ٢. پشتوێنی گرێ‌ـگرێ ⇐ ١. گره کور ٢. کمربند گره‌دار

**گۆزوگومبەت / goz û gumbet**/: ☜ **گوزوگومبەت**

**گۆزە / goze**/: نـاو. گۆز؛ دەفـری سوالـەتی ئـاو ⇐ کوزە

⊡ **گـۆزە بـە دووا شکاندن**:[کنایە] بـەڕێ کـردنی کەسێک بە بێزاری و بـە هیـوای نەهاتنـەوەی بوون ⇐ راهی کردن کسـی بـا بیـزاری بـه امیـد بازنگشتن او بودن

**گۆزەبانە / gozebane**/: ☜ **گوێزەوانە**

**گۆزەڕەبک / gozeřebik**/: نـاو. گیایەکی خواردنییـە ⇐ گیاهی خوراکی

**گۆزەک / gozek**/: ☜ **گوێزنگ**

**گۆزەکە / gozeke**/: ناو. ١. ☜ **گوێزنگ** ٢. جـگ؛ میچ ⇐ ١. ☜ **گوێزنگ** ٢. شتالنگ

**گۆزەکـەر / gozeker**/: نـاو. گۆزەگــەر؛ گۆســکەر؛ هەوڕگەر؛ بیرۆت؛ کاسەکەر؛ ئیربارکەر ⇐ کوزەگر

**گۆزەگەر / gozeger**/: ☜ **گۆزەکەر**

**گـۆزەڵ / gozeł**/: ئاوەڵــناو. جــــوان؛ خوشــــیک؛

خۆشکۆک ☰ زیبا

**گۆزەڵدان / gozełdan/**: ناو. شوێنی دانانی گۆزەی ئاو لە ماڵدا ☰ محل گذاشتن کوزەی آب در منزل

**گـۆزەڵکـە / gozełke/**: ناو. دەستەڵە ☰ کـوزەی کوچک

**گۆزەڵە / gozełe/**: ناو. گوسک؛ گـۆزک؛ گۆزکـە؛ گۆزیلکە؛ گۆسک: ۱. کووپەڵە؛ گـۆزەی پچـووک ۲. کاسەی جێ میزی منداڵ لـە بێشـکەدا ☰ ۱. بستو؛ سبوی کوچک ۲. لگن گهواره

**ـ گـۆزەوە / gozewe-/**: پاشەوشە. گۆزینـەوە ‹ماڵگۆزەوە› ☰ انتقال دهنده

**گۆزیان / gozyan/**: ☜ **گواستنەوە**

**گۆزیانەوە / gozyanewe/**: ☜ **گواستنەوە**

**گۆزیای / gozyay/**: چاوگ. گەوزان ☰ غلتیدن

**گۆزیلکـە / gozîlke/**: نـاو. ۱. ☜ **گۆزەڵـە** ۲. هەناری تازە خڕبوو ☰ ۱. ☜ **گۆزەڵە** ۲. انار تـازە گرد شده

**گۆزین / gozîn/**: چاوگ. تێپەڕ. //گۆزیـت؛ دەگـۆزی؛ بگـۆزە// ۱. هەڵکێشـان (لـە بـیر و ...) ۲. ☜ **گواسـتنەوە** ☰ ۱. برکشـیدن (از چـاه و...) ۲. ☜ **گواستنەوە**

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەگۆزین

**گۆزینگ / gozîng/**: ☜ **گویزنگ**

**گۆزینـەوە / gozînewe/**: چـاوگ. گۆزانـەوە؛ لـە شوێنێکەوە بۆ شوێنێ چوون ☰ تغییر مکان دادن

**گۆزێر / gozêr/**: ناو. دارە گوێز ☰ درخت گردو

**. گۆزێنەوە / gozênewe-/**: ☜ **ـ گۆزەوە**

**گۆژد / gojd/**: ☜ **گۆشت**

**گۆژدەوەکۆ / gojdeweko/**: ☜ **گۆشتکوت**

**گۆژگیرە / gojgîre/**: ☜ **گۆشەگیرە**

**گۆژنـەو / gojnew/**: نـاو. گۆژنـەوە؛ گلـێنەی ئـاو خواردنەوە؛ شەربەی سواڵـەت ‹تیکلـەی شـاری و دیزە و گۆژنەو/ کاسـە و گلـێنە بـۆ ئـاوخواردن شـەو «حەقشناس»› ☰ لیوان سُفالی

**گۆژنەوە / gojnewe/**: ☜ **گۆژنەو**

**گۆس / gos/**: ناو. پەنگر؛ پۆلووگر؛ ماشە؛ مقـاش ☰ ماشە؛ انبُر زغالگیر

**گۆسـارتمە / gosartme/**: ئاوەڵـناو. ۱. بـێشـەرم و ئابڕوو ۲. گاڵتەجاڕی بە سووکایەتی ☰ ۱. بی‌شرم ۲. دلقک مسخره

**گۆسارە / gosare/**: ☜ **گۆستێر**

**گۆساڵە / gosale/**: ☜ **گوێرەکە**

**گۆسـان / gosan/**: ناو. ۱. قالۆنچەی سەوزی باڵـدار ۲. گیایەکی دەشتییە ☰ ۱. نـوعی سوسـک سـبز پرنده ۲. گیاهی صحرایی

**گۆسپە / gospe/**: ئاوەڵناو. زەدە؛ عەیبدار ☰ معیوب

**گۆست / gost/**: ☜ **گۆشت**

**گۆستن / gostin/**: ☜ **گواستنەوە**

**گۆستنەوە / gost(i)newe/**: ☜ **گواستنەوە**

**گۆسـتەی / gostey/**: چـاوگ. ۱. گۆزینـەوە؛ گواستنەوە ۲. دانەوە؛ هەڵکەندن (زەوی و ...) ☰ ۱. انتقال دادن ۲. کندن؛ حفاری کردن

**گۆسـتێر / gostêr/**: نـاو. گونەسـتێرە؛ گۆسـارە؛ گووستێرک ☰ کرم شبتاب

**گۆسک / gos(i)k/**: ناو. ۱. ☜ **گۆزەڵە** ۲. گۆژنـەو؛ گلێنەی ئاو خواردنەوە ☰ ۱. ☜ **گۆزەڵە** ۲. لیـوان سفالین

**گۆسکەر / gosker/**: ☜ **گۆزەکەر**

**گۆسوانە / goswane/**: ☜ **گوێسوانە**

**گۆش / goş/**: ناو. ۱. ☜ **گوێ** ۲. *[کینایە]* ئاوەز؛ فام ‹هۆش و گۆشی فەوتاوە› ☰ ۱. ☜ **گوێ** ۲. عقل و فهم

▣ **گۆش تەندووری**: گۆش تەنووری؛ جۆرێ دیـزەی چێشت کە ئەخرێتە تەندوورەوە ☰ نوعی دیزی

**گۆش تەنووری**: ☜ **گۆش تەندووری**

▣ **گۆش کردن**: گوش کـردن: ۱. فرچـک دان؛ بـە

زارۆ ژەک دان ۲. بوونە هۆی خوو گرتن ‹رێی بیر بۆ مێشکمان خۆش کەن/ زمانمان بە کوردی گۆش کەن «گۆران»› ۳. *[کینایە]* فێر کردن ☰ ۱. آغوز دادن به نوزاد ۲. اُنس دادن ۳. یاد دادن

**گۆشاوگۆش** / /goşawgoş/: ☜ **گۆش تاگۆش**

**گۆشبڕ** / /goşbiř/: ئاوەڵناو. *[کینایە، پەلار]* دەسبڕ؛ خاپینۆک ☰ گوشبُر

**گۆشبەراواز** / /goşberawaz/: ئاوەڵناو. ئاڵقەبەگوێ؛ هەڵقەبەگوێ؛ گوێلەمست ☰ حلقەبەگوش

**گۆشپاق** / /goşpaq/: ☜ **گۆشقاب**

**گۆش پیل** / /goşpîl/: ☜ **گوێ فیل**

**گۆشت** / /goşt/: ناو. گۆست؛ گووشت؛ گۆژد: ۱. نەرمایی لەشی گیانداران، بەتایبەت مۆرەغەداران، بریتی لە ماسوولکەی دەوری ئێسک ۲. بەشی نەرمی لەشی گیاندارانی حەلاڵ کە دەخورێ (وەک: گۆشتی گا، ماسی، مریشک، پەز و...) ‹گۆشت گرانە، نەخواردنی هەرزانە «مەسەل»› ۳. *[مەجاز]* بەشی ئاوداری ناوەوەی میوە ☰ ۱. گوشت جاندار ۲. گوشت حلال ۳. گوشت میوه

◙ **گۆشتی سەر چەپەر:** *[کینایە]* هەرزان و حازر ‹وەکوو مەیموون لاساکەرە/ بەلاش گۆشتی سەر چەپەرە «هەژار، *چوار ناميلکە*»› ☰ ارزان و بدون زحمت

**گۆشتی قەڵەو:** ۱. گۆشتێ کە بەز و دووگی زۆرە ۲. گاڵتەیەکی زارۆکانە ☰ ۱. گوشت پر چربی ۲. از بازی‌های کودکان

**گۆشتی گەردەمل:** *[کینایە]* ملۆزم و دەس‌هەڵنەگر ‹لێم بۆتە گۆشتی گەردەمل و لە کۆڵم نابێتەوە› ☰ موی دماغ

◘ **گۆشت گرتن:** قەڵەو بوون ☰ چاق شدن

**گۆشتی برژاو دەرنەچوون:** *[کینایە]* شەڕ و تەقەی زۆر و پڕمەترسی لە ئارادا بوون ‹شەڕێکە گۆشتی برژاو دەرناچێ!› ☰ جنگ و درگیری سخت شدن

**گۆشتی خۆ تاڵ کردن:** *[کینایە]* بە قسە و ئاکاری نەگونجاو خۆ لە بەرچاوی خەڵک خستن ☰ خود را منفور ساختن

**گۆشتی کەسێ تاڵ بوون:** *[کینایە]* ڕەزاگران بوون ☰ گرانجان بودن

**گۆش‌تاگۆش** / /goştagoş/: ئاوەڵکار. *[مەجاز]* گۆشاوگۆش؛ پەڕاوپەڕ؛ لەم سەر تا ئەو سەر ‹خەڵکێکی زۆر گۆش‌تاگۆش دانیشتبوون› ☰ گوش‌تاگوش

**گۆشتاڵ** / /goştał/: ☜ **گۆشتتاڵ**

**گۆشتاو** / /goştaw/: ناو. شۆرباوی گۆشت ☰ آبگوشت

**گۆشتبرژە** / /goştbirje/: ناو. چەند شیشی لە یەکتر جۆشدراو بۆ کەواو ☰ سیخ‌های متصل به هم برای بریان کردن گوشت

**گۆشتبرژێن** / /goştbirjên/: ناو. گۆشتبرێژ؛ گۆشتبژێر؛ کەواوکەر؛ کەبابچی ☰ کبابچی

**گۆشتبرێژ** / /goştb(i)rêj/: ☜ **گۆشتبرژێن**

**گۆشتبژێر** / /goştb(i)jêr/: ☜ **گۆشتبرژێن**

**گۆشتبەرخۆک** / /goştberxok/: ☜ **گوێ‌بەرخۆڵە**

**گۆشتپارە** / /goştpare/: ناو. ۱. پارچەگۆشت ۲. پاژی گۆشتی زیادی بە لەشەوە ۳. *[کینایە]* گۆشتپەرە؛ زارۆی گیان تێنەگەڕاو ☰ ۱. تکه گوشت ۲. اضافه گوشت بر اندام ۳. جنین جان نگرفته

**گۆشتپەرە** / /goştpere/: ☜ **گۆشتپارە-۳**

**گۆشت‌پیس** / /goştpîs/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* گۆشتخراو؛ تایبەتمەندی کەسێ کە برینی درەنگ چا دەبێتەوە ☰ ویژگی کسی که زخمش دیرالتیام است

**گۆشتتاڵ** / /goşttał/: ئاوەڵناو. گۆشتاڵ؛ ڕەزاقورس؛ زەڕەتاڵ؛ ئێسک قورس؛ خوێنتاڵ ☰ گرانجان

**گۆشتخراو** / /goştx(i)raw/: ☜ **گۆشت‌پیس**

**گۆشتخۆر** / /goştxor/: ئاوەڵناو. ۱. فێرەگۆشت؛

هۆگرتووی گۆشت خواردن ٢. بە تایبەتمەندی خواردنی گیانەوەرانەوە ‹ڕوەکی گۆشتخۆر› ◘ ١و٢. گوشتخوار

**گۆشتخۆش** / goştxoş/: ئاوەڵناو. خۆش‌گۆشت: ١. خاوەن گۆشتی بەتام و چێژە ‹کەو پەلەوەرێکی گۆشت‌خۆشە› ٢. *[کینایە]* خاوەن گۆشتی وا کە لە زامدار بووندا، زوو گۆشتەکەی زوون بهێنێتەوە و خۆش بێتەوە ◘ ١و٢. خوش‌گوشت

**گۆشتفرۆش** / goştf(i)roş/: ناو. قەساب؛ قەساو ◘ قصّاب

**گۆشتکوت** / goştkut/: ناو. گۆشکوت؛ گووشتکوت؛ گۆژدەوەکۆ؛ هەڵەکوت؛ کوتکی گۆشت کوتان ◘ گوشتکوب

**گۆشتگا** / goştga/: ناو. جۆرێ ترێ ◘ نوعی انگور

**گۆشتگران** / goştg(i)ran/: ئاوەڵناو. ١. قەڵەوی زەبەلاح ٢. *[کینایە]* خوێنتاڵ؛ ڕەزاگران ◘ ١. گُندەبک ٢. گرانجان

**گۆشتن** / goştin/: ئاوەڵناو. گۆشتین؛ پڕگۆشت؛ قەڵەو ‹زەندی گۆشتن› ◘ چاق؛ فربه

**گۆشتنی** / goşt(i)nî/: ناو. قەرەوی؛ قەڵەوی؛ چاخی ◘ چاقی

**گۆشتەبەرغێلە** / goşteberğîle/: ☜ **گوێبەرخۆلە**

**گۆشتەزوون** / goştezûn/: ☜ **گۆشتەزوونە**

**گۆشتەزوونە** / goştezûne/: ناو. گۆشتەزوون؛ گۆشتەوزوون؛ گۆشتەژوو؛ شانەی ساڕێژ بوونی برین ‹برینەکەی گۆشتەزوونەی هێناوەتەوە› ◘ بافت ترمیم شدەی زخم

**گۆشتەزەوی** / goştezewî/: ☜ **گۆشتەزەوین**

**گۆشتەزەوین** / goştezewîn/: ناو. گۆشتەزەوی؛ زەمینی نەرمان و بێ‌بەرد ◘ زمین نرم و بی‌سنگ

**گۆشتەژوو** / goştejû/: ☜ **گۆشتەزوونە**

**گۆشتەگیرە** / goştegîre/: ناو. زیپکەی پێست کە نیشانەی قەڵەو بوونە ◘ نوعی جوش پوست، نشانەی چاق شدن

**گۆشتەوزوون** / goştewzûn/: ☜ **گۆشتەزوونە**

**گۆشتی**[١] / goştî/: ناو. گۆشتێ کە خوێ دەکرێ و لە ناو شەکیلەدا ڕادەگیرێ بۆ تفاقی زستان ◘ گوشت نمکسود و خشکیده، آذوقەی زمستان

**گۆشتی**[٢]: ئاوەڵناو. ڕاگیراو بۆ گۆشتەکەی (ئاژەڵ) ‹ماڵی گۆشتیم ڕاگرتووە› ◘ گوشتی (دام)

**گۆشتین** / goştîn/: ☜ **گۆشتن**

**گۆشفیل** / goşfîl/: ☜ **گوێفیل**

**گۆشقاب** / goşqab/: ناو. گۆشپاق؛ قۆشقاپ؛ دەوری ◘ بشقاب

**گۆشک** / goşik/: ☜ **گۆیژ**

**گۆشکار** / goşkar/: ناو. کەوش‌دروو؛ پێڵاوکەر ◘ کفّاش

**گۆشکوت** / goşkut/: ☜ **گۆشتکوت**

**گۆشگرە** / goşg(i)re/: ناو. دەزگرە؛ دەسگیر ◘ دستگیرەی آشپزخانه

**گۆشگیر** / goşgîr/: ئاوەڵناو. بەگوێ؛ بەلبەلەگۆش؛ گوێڕادێر ◘ حرف‌شنو

**گۆشگیرە** / goşgîre/: ☜ **گۆشەگیرە**

**گۆشلە** / goşle/: ناو. دارک و قونچکی هێشووە ترێ ◘ قسمت‌های غیرخوراکی خوشەی انگور

**گۆشماساو** / goşmasaw/: ☜ **گوێماسیلە**

**گۆشنای** / goşnay/: چاوگ. ئەزموون؛ تاقی کردنەوە ◘ آزمودن

**گۆشوارە** / goşware/: ☜ **گوارە**

**گۆشە** / goşe/: ناو. ١. سووچ؛ قوژبن ٢. کاژێری ماڵ؛ سووچ و قوژبنی ئۆدە ٣. قسەی بەتێکول ٤. ئامرازێکی دارتاش و بەنا ٥. ☜ **گۆشەگیرە** ٦. ☜ **گۆشێ** ٧. لە بەشەکانی دەزگای مووسیقای ئێرانی ٨. *[مەجاز]* کنار؛ پەنا؛ قەراخ ‹نیمە ئاواڵێ لە گۆشەی بێکەسیدا، غەم نەبێ/ چاکە ئەو لێرەش وەفای هەر ماوە، سایەی کەم نەبێ «هێمن»› ◘ ١.

کُنج؛ گوشە ٢. گوشە و زاویەی اُتاق ٣. سخن کنایەآمیز ۴. از ابزار بنّایی و نجاری ۵. ☜ **گۆشەگیرە** ۶. ☜ **گۆشێ** ٧. گوشەی موسیقی ٨. گوشە

**گۆشەبڕکە** / goşebiřke/: ناو. دووکلکە؛ سۆلسۆلە؛ جۆرێک قالۆچە ⊡ گوشخیزک

**گۆشەبەرخیلە** / goşeberxîle/: ☜ **گوێبەرخۆڵە**

**گۆشەدار** / goşedar/: ئاوەڵناو. خاوەن سووچ ⊡ دارای گوشە

**گۆشەر** / goşer/: ناو. زەنبیلە؛ قەرتالەی دەسکداری لە پووش چنراو ⊡ زنبیل

**گۆشەقانی** / goşeqanî/: ناو. گۆبازی؛ گۆ و گۆچان بازی ⊡ گوی و چوگان بازی

**گۆشەک** / goşek/: ناو. گلالە؛ گۆشەگەروو؛ گەلالە؛ گەلالوچک؛ گەلالووچک؛ ئالوو؛ بادامەی قوڕگ ⊡ لوزە

**گۆشەگەروو** / goşegerû/: ☜ **گۆشەک**

**گۆشەگیر**[١] / goşegîr/: ناو. ئامرازی ژێ لە کەوان قایم کردن ⊡ ابزاری در زەکمان

**گۆشەگیر**[٢]: ئاوەڵناو. دوورەخەڵک؛ دوورەپەرێز ⊡ گوشەگیر

**گۆشەگیرە** / goşegîre/: ناو. گوشگیرە؛ گۆژگیرە؛ گۆشە؛ گۆشگیرە؛ باڵەشتە؛ باڵنجەک؛ نازباڵنج؛ نازباڵشت؛ ژێرمرکی؛ باڵنجی سووک و بچووک ⊡ نازبالش

**گۆشەگیری** / goşegîrî/: ناو. ١. دوورەپەرێزی ‹گۆشەگیری کەر پەی وێت بە ڕاحەت/ جە ڕەنج دنیا ببە فەراغەت «*شانامەی کوردی*، هەورامی»› ٢. /*کینایە*/ سۆفیەتی و تەرکەدنیایی ‹نەگەییە دامەنی دەستی دوعا سا دەبمە خاکی ڕێی/ تەریقەی گۆشەگیری بەر دەدەم ئەمجارە ڕێ دەگرم! «مەحوی»› ⊡ ١. گوشەگیری ٢. زُهد

**گۆشەمڵە** / goşem(i)łe/: ناو. بنەگیایەکی یەکسالان لە تیرەی گەزنە بە ڕیشووی ناسک، لقی نەرم و گەڵای باریکی وەک گوێی مشکەوە ⊡ گوش‌موش

**گۆشەنشین** / goşen(i)şîn/: ئاوەڵناو. گۆشەگیر؛ خانەنشین ⊡ گوشەنشین

**گۆشەنشینی** / goşen(i)şînî/: ناو. گۆشەگیری؛ دوورەپەرێزی ⊡ گوشەنشینی

**گۆشەنەماو** / goşenemaw/: ئاوەڵناو. پەخ؛ کەل؛ کل ‹ئەسکەناسی گۆشەنەماو› ⊡ فاقد گوشە

**گۆشەوارە** / goşeware/: ناو. ١. ☜ **گوارە** ٢. ئامرازێکی ئەندازیاری ⊡ ١. ☜ **گوارە** ٢. گونیا

**گۆشی** / goşî/: ☜ **گوشی**

**گۆشیای** / goşyay/: چاوگ. تەجرەبە کران؛ تاقی کرانەوە ⊡ آزمودە شدن

**گۆشین** / goşîn/: ☜ **گوشین**

**گۆشێ** / goşê/: ناو. گۆشە؛ گۆشتەندووری ⊡ نوعی دیزی کوچک

**گۆفک** / gofik/: ناو. ١. ☜ **گوفك ـ١** ٢. گولەنگ؛ گولینگ ٣. پۆ؛ هەواڵی تاڵ ⊡ ١. ☜ **گوفك ـ١** ٢. منگولە ٣. پود

**گۆفەک** / gofek/: ☜ **گوفك ـ١**

**گۆفیل** / gofîl/: ☜ **گوێفیل**

**گۆڤ** / gov/: ناو. ئاغەڵ؛ هۆڵەمەڕ ⊡ آغُل

**گۆڤا** / gova/: ☜ **گەواه**

**گۆڤار** / govar/: ناو. گۆوار؛ کۆڤار؛ ڕۆڤار؛ بەلاڤۆکی غەیرە ڕۆژانە (حەفتانە، مانگانە، دوومانگانە و...) ⊡ مجلّه

**گۆڤان** / govan/: ناو. ١. گۆڕەپانی یاری کردن ٢. گۆڤا؛ گەوا؛ شایەت ⊡ ١. میدان بازی ٢. شاهد

**گۆڤاننامە** / govanname/: ناو. بەڵگەی نووسراوی کارکراو ⊡ کارنامە

**گۆڤانی** / govanî/: ناو. شایەتی؛ کاری ئاگایی دان لە سەر کارێک ⊡ گواهی

**گۆڤاه** / govah/: ☜ گەواه

**گۆڤدە** / govde/: ☜ گۆدە

**گۆڤشاندن** / govşandin/: ☜ گوشین

**گۆڤک** / govik/: ☜ گوفك ـ١

**گۆڤماڵ** / govmal/: ناو. کەسێ ئاغەڵی پەز پاڕوو دەکا ☳ آغُل روب

**گۆڤەند** / govend/: ناو. گۆوەند: ١. شایی؛ بەزم و زەماوەند ‹ئەڤ گۆڤەندێ میر تێدا، ئەڤ گرارا سیر تێدا، ... «مەسەل»› ٢. هەڵپەڕکێ؛ دیلان ☳ ١. جشن عروسی ٢. رقص گروهی

▣ **گۆڤەندا فەقییان** بێریتە؛ جۆرێ هەڵپەڕکێ ☳ نوعی رقص گروهی

**گۆڤەندەک** / govendek/: ناو. جغز؛ جەغز؛ کۆز ☳ دایره

**گۆک**[1] / gok/: ناو. ١. سەرەتای شلخە دانی مێشەنگوین ٢. غونچەی شکۆفەی دار ٣. تۆپ؛ تۆپە ٤. ☜ گوێرەکە ☳ ١. شروع بیرون آمدن نسل نوین زنبورعسل از کندو ٢. غنچەی شکوفه ٣. توپ ٤. ☜ گوێرەکە

**گۆک**[2]: ناوەڵناو. خڕی ورد ☳ مُدوَّر ریز

**گۆکاری** / gokarî/: ناو. ڕەوتی بزووتن و کار کردنی زمان و دەست ☳ حرکت و جنبش دست و زبان

**گۆگ** / gog/: ☜ گۆگە

**گۆگاپێ** / gogapê/: ناو. فووتباڵ؛ تۆپانێ بەپا؛ تۆپی پێ ☳ فوتبال

**گۆگباخان** / gogbaxan/: ☜ گولەبەڕۆژە

**گۆگجە** / gogce/: ناو. ئاڵوو زەر؛ حەلووکە زەردە ☳ آلو زرد

**گۆگرد** / gogird/: ناو. ١. کوکورد؛ کەوکورد؛ کەرکۆت؛ توخمی کیمیایی ناکانزا، بە ژمارەی ئەتومی ١٦ و کێشی ئەتومی ٣٢,٠٦، کە ماکێکی زەردە و لە پیشەسازیدا زۆری بەهرە هەیە ٢. شخاتە؛ شەمچە؛ کرمیت ☳ ١. گوگرد ٢. کبریت

**گۆگە** / goge/: ناو. گۆگ؛ تۆپی پچووکی یاری ☳ توپ کوچک بازی

**گۆگەرجین** / gogercîn/: ناو. کۆتر؛ کەمووتەر؛ کەڤۆک ☳ کبوتر

**گۆگەڕین** / gogeřîn/: ناو. گووخلێنکە؛ گووخرتەوکەرە؛ قالۆنچەی گووگلێن ☳ جُعل

**گۆگەم** / gogem/: ناو. گاوومە؛ گیایەکی بالابەرزە زۆر گوڵی زەرد دەر دەکا، بۆ هەنگ خراپە ☳ گیاه جوجم

**گۆل**[1] / gol/: ناو. ١. ئەستێر؛ ئەستێلک؛ هەسێل ‹گەلێ گۆلە لەو چۆلە یەخسیری خاکن «سوارە»› ٢. زرێبار؛ دەریاچە ٣. کەردی چەڵتووکجاڕ ‹پردانەیە، ئەمما نە وەکوو دانەیی چەڵتووک/ بەحرم وتووە نەک وەکوو گۆلی مەرەزانە «نالی»› ٤. نەخشی قوماش و جاجم ٥. کەردی خڕیلە و تۆزێ قوول بۆ هەندێ کشتوکاڵ (وەک: تەماکۆ، تەماتە و...) ‹گۆلێ تەماتە› ٦. گەمەی قەمچان ٧. ڕەوتی وەرگەڕان؛ گلار بوون ٨. کرمی ناو زگ ٩. سن؛ بەلای گەنم ١٠. قولفەی چنین (لە گۆرەوی و دەستکێش و ...دا) ١١. ☜ گوێرەکە ☳ ١. استخر ٢. دریاچه ٣. کرت شالیزار ۴. نقش پارچه و جاجیم ۵. جالیز گرد و عمیق‌تر ۶. بازی یەقُل‌دوقُل ۷. فرایند وارونه شدن؛ چپ شدن ۸. انگل شکم ۹. آفت گندم ۱۰. حلقەی نخ در بافتنی ۱۱. ☜ گوێرەکە

▣ **گۆل برین** کەردووساز کردن لە چەڵتووکجاڕدا ☳ کرت‌بندی شالیزار

**گۆل کردن** ١. دروست کردنی ئەستێل ٢. کەردوو لێدانی چەڵتووکجاڕ ☳ ١. ساختن استخر ٢. کرت زدن شالیزار

**گۆل**[2]: ناوەڵناو. نەفام؛ بێئاوەز؛ حۆل ☳ خُل؛ کم‌فهم

**گۆلاڵ** / golal/: ناو. گۆل؛ کرمی زگ ☳ انگل شکم

**گۆلاو** / golaw/: ناو. گوەل: ١. ئەستێر؛ هەسێل؛ ئەستێل ٢. گۆلی چکۆلە ☳ ١. استخر ٢. برکەی

کوچک

▣ **گۆلاو گرتن:** پەنگاو گرتنەوە بۆ ئاودێری ‹گۆلاوێ بگرن بۆ باقەبێنێ/ چاکی بشێلن با نەیدەڵێنێ «حەقیقی»› ≡ حوضچەی آبیاری ساختن

**گۆلبڕ** / golbiř/: ناو. کەسێ کە کەردووی چەڵتوکجاڕ ساز دەکا ≡ کرتساز شالیزار

**گۆلتک** / goltik/: ناو. گۆلی گچکە؛ ئەستێری پچووک ≡ استخر کوچک

**گۆلڤند** / golvind/: ناو. تۆپی لە پەڕۆ چندراو بۆ کایە و تۆپان ≡ توپ پارچەای برای بازی

**گۆلک** / golik/: ناو. ١. ☚ **گویرەکە** ٢. میوەی بچووکی شەنگڵەبەرەکەتە (وەک: گیلاس) ٣. *[کینایە]* ڕەوتی ئاوسان و با کردنی زگ ≡ ١. ☚ **گویرەکە** ٢. میوەی دوقلوی کوچک ٣. ورم و آماس شکم

**گۆلکاو** / golkaw/: ناو. گۆلی بچووک ≡ آب جمع‌شده در گودی

**گۆلکڤان** / golikvan/: ناو. شوانی گۆلکان ≡ گوساله‌چران

**گۆلگ** / golig/: ناو. ئەسپی سواری ≡ اسبِ سواری

**گۆل ـ گۆل**[1] / gol gol/: ناو. دەغڵی شینی بڵندی لێکهاڵاو ≡ ساقه‌های سبز و بلند به هم پیچیده‌ی غله

**گۆل ـ گۆل**[2]: ئاوەڵناو. ١. کەردوو لێدراو (زەوی) ٢. خاوەن قولکەئاوی زۆر بە شوێن یەکا ٣. لە کۆلدراوی بەپێل (قوماش) ‹جاجم و بووزووی زاخۆ هەمووگۆل ـگۆلە› ≡ ١. کرت‌زده (زمین) ٢. با گودال‌های پشت سرهم آب ٣. موجدار (پارچه)

**گۆل ـ گۆل**[3]: ئاوەڵکار. بە شێوەی گۆل ـ گۆل؛ قولکە لە شوێن قولکە ‹دەشتی مەریوان گۆل ـ گۆل مەرەزە/ سەد با مسکێنی، دەماخت بەرزە «فولکلۆر»› ≡ به صورت گودال‌های پشت سر هم

**گۆڵمانج** / golmanc/: ناو. ئەستێر؛ هەسێل ≡ استخر

**گۆڵمە** / golme/: ناو. پڕ بە دەستێ (زۆرتر بۆ گیا) ≡ پُر یک کف دست (گیاه)

**گۆلە**[1] / gole/: ناو. ١. کەللا؛ هەڵمات؛ کەلای کایە کردن لە بەرد ٢. گالە و دەنگی بەرز ٣. نەخۆشی گوێلک ٤. پێشەنگی ئاژەڵ و پاتاڵ ≡ ١. تیله ٢. صدای بلند ٣. بیماری گوساله ٤. جلودار گله

**گۆلە**[2]: دەنگ. وشەی بانگ کردنی گۆلک ≡ کلمه‌ی صدا زدن گوساله

**گۆلەسار** / gulsar/: ☚ **گوێرەوسار**

**گۆلەستێرە** / golestêre/: ناو. ئەستێرۆک ≡ کرم شبتاب

**گۆلەکە** / goleke/: ☚ **گوێرەکە**

**گۆلەگۆل** / golegol/: ئاوەڵکار. سەلانە ــ سەلانە؛ سالانە ـ سالانە؛ قۆلەقۆل؛ کار و ڕەوتی سەبر ـ سەبر ڕۆیشتن ≡ سلانه ـ سلانه

**گۆلەمەرەزە** / golemereze/: ناو. گەڵێش ≡ کرد شالیزار

**گۆڵ**[1] / goł/: ناو. ١. فریو ٢. ☚ **گول ــ٧** ≡ ١. فریب؛ گول ٢. ☚ **گول ــ٧**

▣ **گۆڵ خواردن** فریوان؛ فریو خواردن. هەروەها: **گۆڵ دان** ≡ گول خوردن

**گۆڵ**[2]: پیرۆ. ← **گرێ‌وگۆڵ/ گورج‌وگۆڵ**

**گۆڵخنکێن** / gołxinkên/: ناو. *[کینایە]* کاری پەلامار دان و شەل‌وکوت کردنی کەسێک ‹دەتگرم گۆڵخنکێنت دەکەم› ≡ کتک‌کاری مُفصل

**گۆڵدەر** / gułder/: ئاوەڵناو. فریودەر؛ خاپێن ≡ فریب‌دهنده

**گۆڵگە** / gołge/: ناو. یەکسمی سواری، بە گشتی ≡ ستور

**گۆڵمەز** / gołmez/: ناو. گولمەز: ١. گالتە و حەنەک ‹بە گۆڵمەز و قسەی خۆش کۆڕەکەمانی

گەرم کرد› ٢. زەنا ـ زەنا؛ دەنگ و هەرا؛ قرموقاڵ ☰ ١. شوخی و هزل ٢. سروصدای زیاد

**گۆڵنگ** / guling/: ناو. [کنایه] بەواسیر؛ مایەسیری ☰ بواسیر

**گۆڵۆ** / gulo/: ☜ **گولێتە**

**گۆڵە**١ / gole/: ناو. ١. قفل؛ قولف ٢. گرمەی هەور ٣. لۆغە؛ نەخۆشییەکی زارە ‹گۆڵە لە زمانی داوە› ☰ ١. قُفل ٢. تُندر ٣. نوعی بیماری دهان

**گۆڵە ـ**٢: پێشوشە. ١. نێر (سەگ و کەر) ‹گۆڵەسەگ؛ گۆڵەکەر› ٢. نارەسەن و ناقۆڵا ‹گۆڵەبارگین› ☰ ١. نرینه (سگ و الاغ) ٢. نانجیب و بدقواره (یابو)

**گۆڵەبارگین** / golebargîn/: ناو. ئەسپی نائەسڵی بارەبەر ☰ یابو

**گۆڵەڕۆنینە** / guleřonîne/: ☜ **گوڵهەنگ**

**گۆڵەسەگ** / golesek/: ناو. گەماڵ ☰ سگ نر

**گۆڵەکی** / golekî/: ئاوەڵناو. نێرەکی؛ نێر (ئێستر) ☰ نر (ستور)

**گۆڵەگۆڵ** / golegol/: ناو. زەنا ـ زەنا بە دەنگی بەرز و تێکەڵاو ☰ سروصداهای درهم آمیخته

**گۆڵەمە** / goleme/: ناو. مست؛ مشت؛ گولم ☰ بوکس؛ مُشت گره کرده

**گۆڵەمەباز** / golemebaz/: ناو. مشتوەشێن ☰ بوکس‌باز

**گۆڵەمەبازی** / golemebazî/: ناو. شەڕەمشت ☰ بوکس

**گۆڵێن** / golên/: ناو. تۆپی‌پێ؛ فووتباڵ ☰ فوتبال

**گۆم**١ / gom/: ناو. ١. شوێنێ لە چەم بە ئاوی قووڵی ڕاوەستاو یان ئاوی پەنگ خواردووی ڕووبار و چۆم ‹گۆمی مەلە کردن› ٢. دۆخی پەنگ خواردنەوە و لێک کۆم بوونەوەی ئاو و ... ٣. زنج؛ جێگەی شەوانەی مەڕ لە نزیک گوند ٤. شوێنی وێستانی پاسەوان ٥. ماڵی هاوینە ٦. خانووی دەربەستە ٧. دەم؛ کات ٨. هەنگاو ☰ ١. ژرفاب راکد ٢. حالت به هم رسیدن و جمع شدن آب و ... ٣. استراحتگاه شبانه‌ی گله بیرون آبادی ۴. جای ایستادن نگهبان ۵. خانه‌ی تابستانی ۶. ویلا؛ خانه‌ی مستقل ۷. زمان؛ وقت ۸. گام؛ قدم

**گۆم**٢: ئاوەڵناو. لێڵ؛ نارِوون؛ ئاڵۆز ☰ گُنگ؛ نامفهوم

▣ **کەفتنە ناو گۆم**: [کنایه] سەر سووڕمان و حەپەسان ☰ مات و مبهوت شدن

**گۆماسی** / gomasî/: ☜ **گوێ‌ماسیلە**

**گۆمان** / goman/: ☜ **گومان ـ١**

**گۆماو** / gomaw/: ناو. قووڵایی لە چەمدا ☰ ژرفاب

**گۆمرچە** / gomiřçe/: ☜ **گومرچە**

**گۆمک** / gomik/: ئاوەڵکار. تاوێک؛ دەمێکی کەم؛ تۆزێ لە وەخت ☰ لختی؛ اندک زمانی

**گۆمکە** / gomke/: ناو. بەردی کونی گۆنگەی ئەستێر ☰ سنگ سوراخ تخلیه‌ی استخر

**گۆمگە** / gomge/: ناو. کونی ئاوەڕۆ ☰ سوراخ آبراه

**گۆمە** / gome/: ناو. گۆم؛ پەچە؛ جێی سانەوەی شەوانەی ئاژەڵ لە دەشت ☰ استراحتگاه شبانه‌ی دام در صحرا

**گۆمەزە** / gomeze/: ناو. ١. ☜ **گومەز** ٢. تۆقڵە؛ بڵق؛ بلۆق ☰ ١. ☜ **گومەز** ٢. حُباب

**گۆمەلیقە** / gomelîqe/: ناو. دەمووکانەی نەجاری ☰ غره‌ی نجاری

**گۆمەڵ** / gomel/: ناو. گۆڵمەز؛ زەنا ـ زەنا ☰ همهمه و جنجال

**گۆمیچکە** / gomîçke/: ناو. گۆمی چکۆلە ☰ ژرفاب و کوچک

**گۆمیلکە** / gomîlke/: ناو. دەلاڤ ☰ آب ژرف و راکد

**گۆمێش** / gomêş/: ☜ **گامێش**

**گۆن**١ / gon/: ناو. ١. ☜ **گۆنا** ٢. گیان؛ ژیان ٣. خوێن؛ هوون ٤. گوێن؛ جۆر؛ تەرز ☰ ١. ☜ **گۆنا** ٢. جان ٣. خون ۴. گونه

**گۆن**٢: ئاوەڵناو. مێچکە (ئاژەڵ) ‹چاخا گۆنێ پەز تێ

نێری و بەران بەر ددن ناڤ› 🇮🇷 مادە (احشام)

**گۆنا** / gona/: ناو. گـۆن؛ گۆنـە؛ گوونـا؛ کوڵـمە ‹مێشی خاڵت نافڕێ، بەس باوەشـێنی کـە بـە نـاز/ چونکـە پابەنـدە بـە شـەهدی شـەککەری گۆناتـەوە «ناری»› 🇮🇷 گونە؛ رخسار

**گۆنار** / gonar/: سارستە. وتەیەکە بۆ باوەڕ پێ‌کردن دەیڵێن (وەک بێژی: بە گیانی تۆ) 🇮🇷 لفـظ سـوگند یاد کردن

**گۆنـاگۆن** / gonagon/: ئاوەڵـناو. ڕەنگاوڕەنـگ؛ جۆراوجۆر 🇮🇷 گوناگون

**گۆناندن** / gonandin/: چاوگ. ڕەنگانـدن؛ ڕەنـگ کردن 🇮🇷 رنگ کردن

**گۆنج** / gonc/: نـاو. گۆنگ؛ گۆنگە؛ گونگە؛ لوولـەی لە گڵ یان سمنت کە دە بـن خـاک یـا لـە بـەر دیواری دەنێن، بۆ دەرچوونی ئاو 🇮🇷 تنبوشە

**گۆنجال** / goncal/: ناو. قولکە؛ چاڵ 🇮🇷 چاە؛ گودی

**گـۆنجڕ** / guncir̄/: ئاوەڵـناو. خـوێنمژ؛ خوێنخـۆر. هەروەها: **گونجڕی** 🇮🇷 خونخوار

**گۆنجـە** / gonce/: نـاو. ١. گـونجی ئەسـتێڵ ٢. تەنبوورەی ئاش 🇮🇷 ١. مخرج آب استخر ٢. سـوراخ پایین ناو آسیا

**گۆنر** / gonir/: ناو. قونێر؛ دومەڵ؛ کونێر 🇮🇷 دُمل

**گۆنگ**[1] / gong/: ناو. ١. ☜ **گـۆنج** ٢. سـازەیەکی سیمانی گرۆڤەر کە لە شـوێنی پێـک‌گەیشـتنی چەند لوولە یـا ڕەهەنـدی فـازلاودا دایـدەنێن ٣. لوولەی کۆنکرێتی بۆ شوێنێ کە ئاو لـە ڕێگـە یـا کەنداڵـێ بگوێزرێتـەوە 🇮🇷 ١. ☜ **گـۆنج** ٢. چـاە منهُل ٣. لولەی سیمانی آبرو

**گۆنگ**[2]: ئاوەڵناو. مانانەزانراو 🇮🇷 گُنگ؛ نامفهوم

**گۆنگ**[3]: دەنگ. دەنگی وەشاندنی کوتکی ئاسـن 🇮🇷 صدای زدن پُتک

**گـۆنگرۆ** / gong(i)ro/: ئاوەڵـناو. /پـلار/ تەمـەڵ؛ تەوەزەل؛ تەپ؛ لەشگران 🇮🇷 تنبل

**گۆنگل** / gongil/: نـاو. یـاری و گاڵـتە 🇮🇷 بـازی‌و شوخی

**گۆنگە** / gonge/: ☜ **گۆنج**

**گۆنگەر** / gonger/: ☜ **گۆنگەڵ**

**گۆنگەشە** / gongeşe/: ناو. چەقەوهەرا؛ زەنا_زەنـا 🇮🇷 دادوقال

**گۆنگـەڵ** / gongeł/: نـاو. گۆنگـەر؛ گەنگـەڵ: ١. گۆنگل؛ کایە و شۆخی ٢. دەردیسەر؛ خەرخەشە؛ ئاشێ ٣. زەنا_زەنا؛ زلە؛ چەقەوهەرا 🇮🇷 ١. شـوخی و بازی ٢. دردسر ٣. همهمە و جنجال

⊡ **سەر لە گۆنگەڵ خوریان**: بە شوێن دەردیسەرەوە بـوون ‹مـەحموود نیـوەی ژیـانی لـە زیندانـدا گوزەراندبوو، سەری زۆر لە گۆنگەڵ دەخورا «هەژار، چێشتی مجێور»› 🇮🇷 دنبال دردسر بودن

**گۆنگیر** / gongîr/: ناو. فریشتەی گیان کێشـان 🇮🇷 عزرائیل

**گۆنگیل** / gongîl/: ئاوەڵناو. لوول و لێک‌هاڵاو (موو) 🇮🇷 فرفری (مو)

**گۆنگیلۆک** / gongîlok/: نـاو. ڕەبەنۆک؛ گوڵەمێلاقە 🇮🇷 شقایق نُعمانی

**گۆنل** / gonil/: ناو. هەڕەتی لاوەتی؛ تافی جـوانی؛ جەنگەی لەوەندی 🇮🇷 عنفوان جوانی

**گۆنە** / gone/: ناو. ١. ☜ **گۆنا** ٢. جۆر 🇮🇷 ١. ☜ **گۆنا** ٢. نوع

**گۆنەر** / goner/: ناو. هەڕەت؛ تـاف ‹هـەنوو **گۆنـەرا** گژە و گیا دوورینە› 🇮🇷 موسم

**گۆنەڵ** / goneł/: ناو. سەردەم؛ هەڕەت 🇮🇷 موسم

**گـۆنی**[1] / gonî/: نـاو. ١. گـوونی؛ گۆنیـە؛ گوونیـە؛ گوێنی؛ گوێنوو؛ تـەلیس ٢. ☜ **گـەون** ٣. ☜ **گوان**[2] ٤. خوێن؛ خێن ٥. /کینایە/ شەڕی خوێنین؛ شەڕی سەخت 🇮🇷 ١. گونی ٢. ☜ **گـەون** ٣. ☜ **گوان**[2] ٤. خون ٥. جنگ خونین

**گۆنی**[2]: ئاوەڵناو. ١. ڕەنگێنراو ٢. گیاندار؛ زیندوو 🇮🇷

۱. رنگ‌آمیزی شده ۲. جاندار

**گۆنین** / gonîn/: ئاوەڵناو. گۆنین؛ خوێناوی؛ خلتانی خوێن ☰ خون‌آلود

**گۆنیه** / gonye/: ☜ گۆنی[1]-۱

**گۆنێن** / gonên/: ☜ گۆنین

**گۆوار** / gowar/: ☜ گۆڤار

**گۆوان**[1] / gowan/: چاوگ. نەرم و بڵ بوون لە بەر دەستکاری و گوشین ☰ نرم و لهیده شدن از فشردن

**گۆوان**[2]: ☜ گوان[2]

**گۆوە** / gowe/: ئاوەڵناو. گاوە؛ پواز؛ هۆرە ☰ گوه

**گۆوەر** / gower/: ☜ گویرەکە

**گۆوەشت** / gowesţ/: ناو. هەوایەکی کەونارای گۆرانییە ☰ از آهنگ‌های قدیمی

**گۆوەند** / gowend/: ☜ گۆڤەند

**گۆه** / goh/: ناو. ۱. ☜ گوێ ۲. گۆ؛ خراپیی هەر شتێکی قیت ☰ ۱. ☜ گوێ ۲. گِردی

⊡ **گۆه دان**: ☜ گوێ دان

**گۆهبەل** / gohbel/: ☜ گۆبەل

**گۆهبەلە** / gohbele/: ☜ گۆبەلە

**گۆهبەلی** / gohbelî/: ناو. *[کینایە]* شۆفاری؛ جاسووسی ☰ جاسوسی

**گۆهپان** / gohpan/: ئاوەڵناو. *[پلار]* ۱. تەنبەڵ؛ تەوەزەل ۲. نەفام؛ بێئاوەز ☰ ۱. تنبل ۲. نفهم

**گۆهپسیک** / gohp(i)sîk/: ناو. کارگەگولانە ☰ گیاهی است

**گۆهپێل** / gohpêl/: ئاوەڵناو. ۱. *[پلار]* گوێ داتەپاو ۲. *[کینایە]* تەسلیم‌بوو ☰ ۱. گوش فروهشته ۲. تسلیم شده

**گۆهدار** / gohdar/: ناو. گوێدار؛ گۆهدێر: ۱. بیسەر؛ ئەوی دەبیسێ ۲. سەرپەرست؛ سەرپەرشت ☰ ۱. شنونده ۲. سرپرست

**گۆهداری** / gohdarî/: ☜ گوێداری

**گۆهدرێژ** / gohd(i)rêj/: ☜ گوێدرێژ

**گۆهدێر** / gohdêr/: ☜ گوێدار

**گۆهدێری** / gohdêrî/: ☜ گوێداری

**گۆهسفورە** / gohisfure/: ناو. گەڵاداری تازە دەرهاتوو ☰ برگ نودمیده‌ی درخت

**گۆهشۆڕ** / gohşoř/: ☜ گوێشۆڕ

**گۆهکتک** / gohkitik/: ناو. گیایەکی تاڵی دەرمانی کرمە ☰ گیاهی تلخ ضد کرم

**گۆهن** / gohin/: ناو. گۆن؛ چۆنیەتی وە با هاتنی بزن و مەڕ ☰ جفت‌خواهی گوسفند و بز

**گۆهنەسمتی** / gohnesimtî/: ئاوەڵناو. ۱. کون‌نەکراو (گوێ) ۲. *[کینایە]* گوێ‌نەبیس؛ بێ‌گوێچکە ☰ ۱. ناسُفته (گوش) ۲. حرف‌نشنو

**گۆهەشک** / gohhişk/: ئاوەڵناو. *[پلار]* قسەنەبیس ☰ حرف نشنو

**گۆی** / goy/: ناو. تۆپی خڕی دارین بۆ کاشۆبازی ☰ گوی چوگان

**گۆیا** / goya/: ☜ گوایە

**گۆیار** / goyar/: ناو. ئێشک‌گری قەلا ☰ دیدبان قلعه

**گۆیاری** / goyarî/: ناو. برجی ئێشک‌گری قەلا ☰ بُرج دیدبانی

**گۆیژ** / goy(i)j/: ناو. گۆییژ؛ گڤیشک؛ گوڤیشک؛ گومش؛ گوهووشک؛ گوهیژ؛ گوهیشک؛ گوێچ؛ گیچ؛ گیرچ؛ گیژەڵە؛ گێژۆک؛ گێوژ؛ گوێژ؛ کێوژ؛ گڤیر؛ گڤیژ؛ گڤیش؛ گووچ؛ گوچ؛ گووژ؛ گوژ؛ گوهێژ؛ گهووژ؛ گیژ؛ گویچ؛ گوریچ؛ گویرچ؛ گوویشک؛ گویشک؛ گوشک؛ گۆشک؛ گڤویشک؛ گهیشک؛ گوومش؛ گیژەڵە؛ بلچ؛ برچ؛ بلج؛ بلچی؛ بلت؛ بلەت؛ بلەتی؛ بەلەچ؛ تەنگیز؛ دیژەڵە؛ ڕیلی: ۱. دارچکێکی دڕکاوی بە هێشووەگوڵی بچووک و سپی یان زەردی جوانەوە ۲. بەری ئەو دارە کە چکۆلە و خواردەمەنییە، ڕەنگی زەرد یان سوورە

و پاییزان پێدەگا ☰ ۱و۲. زالزالک

**گۆیژە** / goyje/: ناو. خڕۆکە؛ گلوبوول؛ هەرکام لە خانەکانی نێو پلاسمای خوێن ☰ گلبول

**گـۆیژەڕیخـە** / goy(i)jeřîxe/: نـاو. گۆیژەمـــۆرە؛ گێوژەڕیخە؛ گێوژەمـۆرە؛ جۆرێـک گـۆیژی ورد و تامخۆش ☰ نوعی زالزالک ریز

**گـۆیژەزەردە** / goy(i)jezerde/: نـاو. گێـوژەزەردە؛ جۆرێک گۆیژی ڕەنگ زەرد ☰ زالزالک زرد

**گـۆیژەسـورە** / goy(i)jesûre/: نـاو. گێوژەسـوورە؛ جۆرێک گۆیژی ڕەنگ سوور ☰ زالزالک سُرخ

**گۆیژەکۆڵـە** / goy(i)jekołe/: نـاو. گێوژەکۆڵـــە؛ گۆیژێ کە دارەکەی کورتەبنە و کوڵەی هەیە ☰ نوعی زالزالک

**گۆیژەمۆرە** / goy(i)jemore/: ☜ **گۆیژەڕیخە**

**گۆین** / goyin/: نـاو. گۆیین؛ باڵدارێکی شەو بێدارە ☰ پرندەای شب بیدار

**گۆینـدە** / goyinde/: نـاو. گۆیننـــە؛ قســـەکەر ☰ گوینده

**گۆیننە** / goyinne/: ☜ **گۆیندە**

**گۆیە** / goye/: ☜ **گۆڕەوی**

**گۆیین**[1] / goyîn/: ☜ **گۆین**

**گۆیین**[2]: ☜ **گۆڕین**

**گۆیێن** / goyên/: نـاو. کاشـۆبازی؛ یـاری کاشـۆ ☰ چوگان بازی

**گـو**[1] / gû/: نـاو. ۱. *[شـوورەیی]* گ؛ گـی؛ پیسـی؛ پیسایی بنیادەم ۲. *[مەجاز]* هەر شتێکی نەخوازراو و نابـەجێ ‹دا ئـەو گـووە بکوژنـەوە! (ئامـاژە بـە تەلەڤیزیۆن)› ۳. ☜ **گوێ** ☰ ۱. مدفوع ۲. هر چیـز نامطلوب ۳. ☜ **گوێ**

⊡ **گو بە خۆدا کردن:** *[شوورەیی]* ۱. بە خـۆدا ڕیـان ۲. *[کینایە]* کار بە خراپـی کـردن ☰ ۱. بـر خـود ریدن ۲. گند زدن

**گو بە کڵاوی کەسێک نەپێوان:** *[مەجاز، پلار]* پـرس پێ نەکردن و بە هیچ نەزانین ☰ ترە برای کسی خُرد نکردن

**گو پێخوران:** *[کینایە، پلار]* گوو پێخـوراو بـوون؛ پەشیمان بوونەوە لە کـارێ کـە ئاکـامی بـاش نەبووە ☰ پشیمان شدن از کار

**گو پێخوراو بون:** ☜ **گو پێخوران**

**گو تێکردن:** *[کینایە، پلار]* گوو کردنە ناو (شـتێ)؛ تێک دان و خەراپ کردن (کـارێ) ☰ گنـد زدن (به کاری)

**گو خارن:** ☜ **گو خواردن**

**گو خـواردن:** *[شوورەیی، کینایە]* گـوو خـارن؛ گـوو خوارن: ۱. پەژیوان بوونەوە ۲. کار یان قسـەی ناڕەوا کردن ☰ ۱. پشیمان شدن ۲. غلط کردن

**گو خوارن:** ☜ **گو خواردن**

**گو کردن:** *[شوورەیی]* ڕیان ☰ ریدن

**گو کردنە خۆدا:** ۱. بە خۆدا ڕیان ۲. *[کینایە، پلار]* زۆر ترسان ☰ ۱. ریدن ۲. سخت ترسیدن

**گـو کردنـە نـاو کـارێ/ شتێ:** *[کینایـە، پـلار]* گـوو تێکردن ☰ گند به کاری/ چیزی زدن

**گو کوڵاندنەوە:** *[کینایە، پلار]* گوو وشـکەو کـردن؛ ڕژد بوون؛ دەسقووچاو بوون ☰ خسیس بودن

**گو وشکەو کردن:** ☜ **گو کوڵاندنەوە**

**گـوی زیـایی خواردن:** *[کینایە، پلار]* گـووی مفـت خواردن؛ خۆ تێکوتان و تێکدان ☰ گُـه زیـادی خوردن

**گـوی کەسـێک شـێلان:** *[کینایـە، پـلار]* کەوتنـــە دەردیسەر لە سەر کەسێ ☰ به دردسر افتادن به خاطر دیگری

**گوی مفت خواردن:** ☜ **گوی زیایی خواردن**

**گو**[2]: ئاوەڵناو. *[ناشیرین]* گی؛ گەن؛ پـیس و پـۆخڵ؛ چەپەڵ ‹ئەم ماشێنە گووە هێشـتمانییەوە!› ☰ گُـه؛ بیارزش

**گوئەستێر** / gû'estêr/: ناو. ئەستێرۆک؛ ئاگرەقوولە

🇮🇷 کرم شبتاب

**گووبۆق** / gûboq/: ناو. قەوزەی وردی سەر ئاو 🇮🇷 خزەی نرم

**گووبەرە** / gûbere/: ☜ **گوخلێنکە**

**گووپ** / gûp/: ناو. ١. ☜ **گووپ ـ١** ٢. کاری ئاوساندنی گووپ بە پف 🇮🇷 ١. ☜ **گووپ ـ١** ٢. عمل باد در دهان کردن

**گووپگوشاد** / gûpguşad/: ئاوەڵناو. [کینایە] کیفدەم؛ زارزل 🇮🇷 دهن‌گُشاد

**گووپلدەر** / gûpilder/: ☜ **گوخلێنکە**

**گووپن** / gûpin/: ئاوەڵناو. گووپنە؛ گوپن؛ گووپ زۆپ 🇮🇷 لُپ‌برجسته

**گووپنە** / gûp(i)ne/: ☜ **گووپن**

**گووپەڕنێ** / gûpeřnê/: ناو. کاری ڕوو ڕنینەوە بە نینۆکان 🇮🇷 عمل رخسار را با ناخن خراشیدن

**گووپەڵە** / gûpełe/: ناو. کووپەڵە؛ گۆزەی چکۆڵە 🇮🇷 سبوی کوچک

**گووپی** / gûpî/: ناو. [کینایە] بەڵێنی بێ‌کردار 🇮🇷 قول بی‌عمل

**گووت** / gût/: ☜ **گورتینە**

**گووتک** / gûtik/: ناو. گیایەکە مرۆ دەیخوا 🇮🇷 گیاهی خوراکی

**گووتن** / gûtin/: ☜ **گوتن**

**گووج** / gûc/: ناو. ناحەقی؛ زوڵم ‹ئەم باجە ئیتر گووجە بە سەرماندا داسەپاوە› 🇮🇷 ظُلم

⊡ **گووج پێهێنان:** ئۆقرە لێ هەڵگرتن ‹ڕوومەت و کولمە و چەنە و بەرخەبەبەی/ گووجی پێ هێناوی چۆن ڕێ دەردەبەی؟! «هێمن»› 🇮🇷 بی‌قرار کردن

**گووجکار** / gûckar/: ئاوەڵناو. زاڵم؛ ستەمکار؛ دەستدرێژکەر بۆ مافی خەڵک. هەروەها: **گووجکاری** 🇮🇷 ظالم

**گووچ** / gûç/: ناو. قوژبن؛ سووچ؛ گۆشە 🇮🇷 گوشە؛ زاویە

**گووچارنەک** / gûçarnek/: ناو. بەرگاویلە 🇮🇷 دُم‌جُنبانک

**گووچانگ** / gûçan(i)g/: ناو. عاسا؛ گۆچان 🇮🇷 عصا

**گووخرتەوکەرە** / gûxirtewkere/: ☜ **گوخلێنکە**

**گووخلێرکە** / gûx(i)lêrke/: ☜ **گوخلێنکە**

**گووخلێنکە** / gûx(i)lênke/: ناو. گازولک؛ گامگلۆس؛ گاوزالک؛ گازوولک؛ گووخلێرکە؛ گووخلێنە؛ گووگلێنە؛ گی‌گلوو؛ گی‌گلە؛ گووگلێن؛ گووگەڕین؛ گووخرتەوکەرە؛ گووبەرە؛ گووپلدەر؛ گی‌پلدەرە؛ خلێنکە؛ ڕیخ‌گلێنە؛ کێز؛ کێزک؛ قۆلانچە؛ قۆلانجە؛ قالۆنچەعەجەمانە؛ چۆسڵە؛ مێروویەکی لەش‌پان و قاپلۆخ‌ڕەق لە تیرەی قالۆچە کە پێکەییوەکانیان گزموولەی شیاکە بۆ گەرا تێ‌کردن خڕ دەکەنەوە 🇮🇷 سرگین‌غلتان

**گووخلێنە** / gûx(i)lêne/: ☜ **گوخلێنکە**

**گوور** / gûr/: ☜ **گوێرەکە**

**گووراسن** / gûrasin/: ناو. ١. ئاسنجاو؛ قوڕازە ٢. خۆڵەکەوەی پێکەوەلکاوی ڕەق لە تەندووردا 🇮🇷 ١. قُراضە ٢. خاکستر بە هم چسبیدەی تنور

**گووران** / gûran/: چاوگ. تێنەپەڕ. //گووورای؛ دەگووورێی؛ بگووورێ// ١. ڕسکان؛ پێ‌گەیشتن؛ ڕەگ داکوتان و ڕوان ‹ڕیشەکە گووراوە و شین بووە› ٢. گیان هاتنە بەر و دروست بوونی پیزە ‹زارۆ لە زگیا گووراوە› ٣. لە پێست دەرهاتن 🇮🇷 ١. رُستن ٢. تکوین یافتن ٣. غلفتی از پوست خارج شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: گووراو/ چاوگی نەرێنی: نەگووران

**گووراو** / gûraw/: ئاوەڵناو. ١. ڕسکاو ٢. لە پێست دەرهاتوو 🇮🇷 ١. تکوین‌یافتە ٢. از پوست در آمدە

**گوورز** / gûrz/: ناو. گیایەکی دەشتەکییە 🇮🇷 از گیاهان صحرایی

**گوورشپنەک** / gûrşipnek/: ☜ **گۆڕکەنە**

**گورکەنەک** / gûrkenek/: ☜ **گۆڕکەنە**

**گووروان** / gûrwan/: ☜ **گروان**

**گووراندن** / gûrwandin/: ☜ **گرواندن**

**گوورون** / gûrûn/: ☜ **گرواندن**

**گـووره** / gûre/: نـاو. ١. ☜ **گـــۆرەوی** ٢. ☜ **گوێرەکە**

**گوورەسا** / gûresa/: ☜ **گوێرەوسار**

**گووریل** / gûrîl/: ناو. گیانەوەری گوانداری گیاخۆر، بە لەشی قورس و پێست و مووی ڕەش و بۆرەوە کە لە سەر لەپی پـێ و بـە یارمـەتی قامکـەکانی دەستی، کۆمەکۆم دەڕوا ☰ گوریل

**گوورین** / gûrîn/: چاوگ. تێـەڕ. تێنەپـەڕ. //گووریـت؛ دەگووری؛ بگوورە// ◻ تێپەڕ. ١. پێست دەرهێنـان. ◻ تێپەڕ. ٢. ڕسکان؛ گـووران ☰ ١. غلفتـی پوسـت کندن ٢. تکوین یافتن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەگوورین

**گووز** / gûz/: ☜ **گوێز**[1]ـ١

**گووزان** / gûzan/: ☜ **گوێزان**[2]ـ١

**گووزەبـەز** / gûzebez/: نـاو. ١. گوشمـەی گـوێز و هەنگوین ٢. گوشمەی کونجی و هـەنگوین ☰ ١. مخلوط عسل و گردو ٢. مخلوط کُنجد و عسل

**گووزەک** / gûzek/: ناو. ١. ☜ **گوێزنگ** ٢. ئیسۆت؛ بیباری ڕەش ☰ ١. ☜ **گوێزنگ** ٢. فلفل سیاه

**گووزەڵە** / gûzeɫe/: ناو. ١. وشترگەڵوو ٢. دووزەلە؛ چووزەلە ☰ ١. شترگلو ٢. نی‌لبک

**گـووزی** / gûzî/: ئاوەڵـناو. تـون؛ تـوون؛ تـامتیـژ ☰ تُندمزه

**گووژ** / gûj/: ☜ **گۆێژ**

**گووژە** / gûje/: ☜ **کووژەرە**

**گووژەڵ** / gûjeɫ/: ☜ **گوژاڵك**

**گووستێرک** / gûs(i)têrik/: ☜ **گۆستێر**

**گووسـک** / gûsk/: نـاو. ١. سـەعات؛ کـاتژمێر ٢. قیبلەنوما و هەر ئامرازێ کە نیشانگەری هـەبێ و وەک سـەعات کـار بکـات ☰ ١. سـاعت ٢. هـر وسیلەای کە عقربە داشتە باشد

**گووسک** / gûsik/: ناو. باند؛ پارچەی بـاریکی نـازک بۆ برین پێچان ☰ باند

**گووسە** / gûse/: ناو. ئێسکەماسی ☰ استخوان ماهی

**گووش** / gûş/: ☜ **گوێ**

**گووشبڕ** / gûşbiř/: ☜ **گوێبڕ**

**گووشپارە** / gûşpare/: نـاو. زەنگۆڵـە؛ زەنگوڵـە ☰ زنگوله

**گووشپل** / gûşpil/: ناو. پشکەڵ؛ قشپل ☰ پشکل

**گووشت** / gûşt/: ☜ **گۆشت**

**گووشتکوت** / gûştkut/: ☜ **گۆشتکوت**

**گووشـلە** / gûşile/: نـاو. *[شـوورەیی]* بەلەفیـــرە؛ نەخۆشی زگچوون ☰ اسهال

**گووشە** / gûşe/: ناو. ١. هێشوو؛ هۆشـە ٢. سـووچ؛ قوژبن ٣. ئامرازێکی بەننابیە ☰ ١. خوشه ٢. گوشه؛ زاویه ٣. از وسایل بنایی

**گووشەک** / gûşek/: ☜ **گوێڕەپە**

**گووشەلو** / gûşelû/: ☜ **گوێماسیلە**

**گووشی** / gûşî/: ناو. گۆشی: ١. بیستۆک؛ ئەو بەشە لە دەزگای تەلەفوون کە دەنگـی لێـوە دێ و بـە گوێـوە دەنـرێ ٢. مۆبایـل؛ دەزگـای تەلـەفوونی هاوڕێ ☰ ١و٢. گوشی

**گووشین** / gûşîn/: ☜ **گوشین**

**گووفک** / gûfik/: ناو. ١. گوفک؛ گۆفـک؛ گۆفـەک؛ گۆڤـــک؛ گیفـــەلان؛ گیفـــەلانک؛ گیفـــک؛ سەرانگوێلک؛ سـەنیرگا؛ جێگـەی ڕژانـدن و کـۆ کردنـەوەی سـەنێر ٢. گولـەنگ؛ گولیفـک ☰ ١. شوله؛ سرگینگاه ٢. منگوله

**گووڤ** / gûv/: نـاو. ١. کونی جانـەوەری کێـوی ٢. مۆڵ؛ شوێنی خەوتنی گاڕان لـە کێـو ☰ ١. کُنـام جانور وحشی ٢. محل استراحتگاه احشام در کوه

**گووڤین** / gûvîn/: چـاوگ. مەیین؛ گرسان ☰ مُنعقد شدن

**گوکاری** / gûkarî/: ناو. *[شووره‌یی]* گه‌نه‌کاری: ١. کاری خراپ و دزێو ٢. کاریٚ که ده‌بێته هۆی تێکچوون و خراو بوون ☰ ١. کار زشت ٢. خرابکاری

**گوکوڵێنه‌وه** / gûkułênewe/: ناوه‌ڵناو. *[کینایه]* ڕژد و چکووس ☰ خسیس

**گوکه‌ر** / gûker/: ناو. *[شووره‌یی]* که‌سیٚ که ده‌ڕی ☰ کسی که می‌ریند

**گوگا** / gûga/: ناو. ڕه‌م؛ شیاکه؛ ڕیخ ☰ سرگین

**گوگره**[١] / gûg(i)re/: ☜ **گارنگ**

**گوگره**[٢]: ناوه‌ڵناو. *[پلار]* تازه‌ده‌رهاتوو (سمێڵ) ☰ تازه درآمده (سبیل)

**گوگلێن** / gûg(i)lên/: ☜ **گوخلێتکه**

**گوگلێنه** / gûg(i)lêne/: ☜ **گوخلێتکه**

**گوگه‌ڕێن** / gûgeřên/: ☜ **گوخلێتکه**

**گوگێجه** / gûgêce/: ناو. *[ناشیرین]* گێژ و وێژی؛ سه‌رلیٚشێواوی ☰ گُه‌گیجه

⊡ **گوگێجه گرتن**: *[پلار]* گێژ و وێژ بوون ☰ گُه‌گیجه گرفتن

**گولک** / gûlik/: ناو. ١. چریش؛ ئه‌سرێلک ٢. گێلگێله‌ی سه‌ر به گولێنگه ٣. گوڵ‌چیچک؛ گوڵ‌به‌هار ☰ ١. گیاه سریش ٢. نوعی سرپوش زینتی ٣. گُل صحرایی

**گومرگ** / gûmrig/: ☜ **گومرك**

**گومش** / gûmiş/: ☜ **گۆێز**

**گومشک** / gûmişk/: ناو. گمره ☰ مدفوع موش

**گومک** / gûmik/: ☜ **گومك**

**گون** / gûn/: ناو. ١. ☜ **گوان**[٢] ٢. ڕه‌نگی چڕ و چاو ☰ ١. ☜ **گوان**[٢] ٢. رنگ چشم و ابرو

**گونا** / gûna/: ☜ **گۆنا**

**گونه‌که‌ر** / gûneker/: ناو. *[شووره‌یی، کینایه]* ڕژد؛ چکووس ‹ده‌س‌ڕژد و چنۆک و گوونه‌که‌ر بوو/ بیٚ‌دۆست و قزه و نه‌زان و که‌ر بوو «هه‌ژار، مه‌م‌وزین»› ☰ خسیس

**گونی** / gûnî/: ☜ **گۆنی**[١]ـ١

**گونیا** / gûnya/: ☜ **گونیا**

⊡ **گونیا بون**: له ئاستی یه‌کتر له سووچی ٩٠° دا بوون ☰ گونیا بودن

**گونیه** / gûnye/: ☜ **گۆنی**[١]ـ١

**گونێنه** / gûnêne/: ناو. شێوی که‌شک و ساوار ☰ آش کشک و بلغور

**گوواوی** / gûwawî/: ناوه‌ڵناو. *[شووره‌یی]* گووین؛ گووینه؛ به گووه‌وه تلاو ☰ گُهی

**گووه‌ر** / gûwer/: ☜ **گوێره‌که**

**گوهوک** / gûhuk/: ناو. نه‌رمه‌گویٚ؛ شلکه‌ی گۆش؛ به‌ڵگه‌ی گوێچکه ☰ نرمه‌ی گوش

**گویرز** / gûyr(i)z/: ☜ **گورز**

**گویز** / gûyz/: ☜ **گوێز**[١]ـ١

**گویزان**[١] / gûyzan/: ☜ **گواستنه‌وه**

**گویزان**[٢]: ☜ **گوێزان**[٢]

**گویزک** / gûyzik/: ☜ **گوێزنگ**

**گویشک** / gûyişk/: ☜ **گۆێز**

**گوین** / gûyin/: ☜ **گوواوی**

**گوینه** / gûy(i)ne/: ☜ **گوواوی**

**گه**[١] / ge/: ناو. ١. به‌ندی پێشه ‹پام له گه چووه› ٢. گه‌د؛ سینگ؛ مان له ڕۆیشتن ‹ئه‌م ئه‌سپه گه ده‌گریٚ› ٣. باریکایی سه‌ر پشتی چاره‌ویٚ ☰ ١. مفصل استخوان ٢. امتناع حیوان ٣. باریکه‌ی روی پشت اسب

⊡ **گه گرتن**: ڕک/ سینگ کردن؛ پیٚ چه‌قاندن و نه‌ڕۆیشتن ☰ از رفتن امتناع ورزیدن

**گه**[٢]: ئامراز. ئه‌گه‌ر؛ بێتوو ☰ اگر

**ـ گه**[٣]: پاشگر. ١. نیشانه‌ی شویٚن، به دوای ڕیشه‌ی وشه‌وه دیٚ (ڕه‌گ و پایه) ‹برگه؛ خزگه؛ کۆگه؛ هه‌وارگه› ٢. ـ که؛ نیشانه‌ی تاکی ناسراو ‹گاگه بار› ☰ ١. ـ گاه ٢. نشان معرفه‌ی مُفرد (حرف تعریف)

**گەبر / gebr**/: ☜ **گاور**

**گەبرگە / gebirge**/: ناو. ١. [پلار] کورتەبالای زگزل ٢. جۆرێ کایەی زۆرخانە ٣. دەهۆڵی گەورە ☰ ١. کوتاه قد شکم گُنده ٢. نوعی ورزش زورخانەای ٣. دُهُل بزرگ

**گەبرە / gebre**/: ناو. دەسکێشی لباد بۆ شاڵ و قاشاغ ☰ دستکش نمدی برای نظافت ستور

**گەبۆل / gebol**/: ناو. ١. نواله لە ئارد و ورتکەساوار بۆ گۆلکی ساوا ٢. کاڵ‌هەیران ☰ ١. نواله از آرد و بلغور برای گوسالەی نوزاد ٢. نوعی آش

**گەبە / gebe**/: ☜ **گابنێسك**

**گەبەر¹ / geber**/: ناو. بن‌باخەڵ ☰ زیر بغل

**گەبەر²**: ئاوەڵناو. بەرەڵدا و بێکار ☰ ولگرد و بیکار

**گەبەزە / gebeze**/: ئاوەڵناو. گەوەزە: ١. زلحۆرت؛ زەبەلاح ٢. [کینایە] بەفیز؛ لەخۆبایی؛ بادی‌هەوا ☰ ١. لندهور ٢. مُتکبر

**گەبەک / gebek**/: ناو. قالی خرسەک؛ مافوورەی تیسک‌درێژ ☰ گَبّه

**گەبەڵ / gebeł**/: ناو. ١. تالاو؛ زەلکاو ٢. قەبەڵ؛ کاری پێ سپاردن ☰ ١. مُرداب پوشیده از نیزار ٢. عملِ سپُردن

**گەبەڵە / gebełe**/: ناو. دارستانی چوغور ☰ جنگل انبوه

**گەپ¹ / gep**/: ناو. ١. گاڵتە؛ شۆخی ‹ژیان هەر گاڵتە و گەپ نییە!› ٢. قەپ؛ گاز بە ددان ‹گەپ گوڕ خوەمانیێگ وەل شاعیر› ٣. قسە؛ گوتە ٤. حەپ؛ قووت ‹گەپی کە!› ☰ ١. شوخی و هزل ٢. گاز با دندان ٣. حرف ۴. بلع

▣ **گەپ کردن**: قووت دان ☰ بلعیدن

**گەپ²**: ئاوەڵناو. ١. زل؛ زەلام؛ درشت ٢. جێ‌بەرز ☰ ١. درشت؛ گُنده ٢. بلندپایە

**گەپ³**: دەنگ. حەپەی سەگی بێ ددان ☰ واق سگ بی‌دندان

**گەپتیکە / geptîke**/: ئاوەڵناو. [کینایە] پارووگلێن؛ پارووزل؛ لوقمەگەورە؛ فرەخۆر ☰ پُرخور

**گەپجاری / gepcarî**/: ناو. تەلفیز؛ تەلفیس؛ حەنەک؛ گەمە و گەپ ☰ شوخی؛ مسخرگی

**گەپجاڕ / gepcař**/: ناو/ ئاوەڵناو. گاڵتەجاڕ ☰ مسخره

**گەپچاڕ / gepçař**/: ☜ **گاڵتەجاڕ**

**گەپچان / gepçan**/: چاوگ. شاخەوشاخ بوونەوە؛ بە سەرەوە وێک‌کەوتن ☰ شاخ به شاخ شدن؛ با سر به هم برخوردن

**گەپچاندن / gepçandin**/: چاوگ. ١. ڕووخاندن؛ ڕماندن ٢. وێک‌کەوتن ٣. فڕێ دان ☰ ١. خراب کردن ٢. برخورد کردن ٣. پرت کردن

**گەپڕووگ / geprûg**/: ناو. جیقلدان؛ جیکلدان ☰ چینه‌دان

**گەپگوڕ / gepguř**/: ناو. زەنا-زەنا؛ چەقەچەق ‹ژنان ئەڕا خوەیان گەپگوڕ دان› ☰ همهمه و غوغا

**گەپل / gepl**/: ناو. بەرهەڵست؛ پێش‌لێ‌گر ☰ مانع

**گەپڵە / gepłe**/: ناو. ١. چمە؛ دونبەلان ٢. پیازەخووگانە؛ گیایەکە بنەکەی دەخورێ ☰ ١. دُنبلان ٢. گیاهی با پیاز خوردنی

**گەپوگاڵتە / gep û gałte**/: ناو. گاڵتەوگەپ؛ شۆخی و کایە و قسەی خۆش؛ جیکلدان ‹خواخوامان بوو شەوانی سێ‌شەمە و جومعە لە ناوماندا بێ و لە گەپوگاڵتەدا یاریمان بکا «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ بازی و شوخی

**گەپۆ / gepo**/: ئاوەڵناو. [پلار] پیری لە کارکەوتوو ☰ پیر لکنته

**گەپۆڵ / gepol**/: ئاوەڵناو. شەپلە لێ دراو ☰ فلج؛ لمس

**گەپۆلی / gepolî**/: ناو. شەپلە (زۆرتر بۆ دەستی دەڵێن) ☰ بیماری فلجی (دست)

**گەپە¹ / gepe**/: ناو. ١. قوم؛ فڕ ٢. بۆشایی زار ☰

۱. جُرعه ۲. فضای دهان

**گەپە**[2]: دەنگ. حەپەی پیرەسەگی ددان وەریو 🇮🇷 واق سگ بی‌دندان

**گەپە.گەپ / gepegep**: دەنگەناو. حەپە ـ حەپی سەگی بێ ددان 🇮🇷 واق ـ واق سگ بی‌دندان

**گەپین / gepîn**: چاوگ. حەپین؛ ڕەوین؛ وەڕین 🇮🇷 پارس کردن

**گەت / get**: ناو. ئەندام؛ تەن؛ لەش 🇮🇷 تن؛ بدن

**گەجە / gece**: ئاوەڵناو. گەچە؛ غەوارە؛ غەریبە 🇮🇷 بیگانه

**گەجەر / gecer**: ئاوەڵناو. کز؛ دالگۆشت 🇮🇷 لاغر

**گەجەر ـ گوجەر / gecer gucer**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* خۆڕی‌وتۆڕی؛ لات و خوێڕی 🇮🇷 لات‌ولوت

**گەچ / geç**: ناو. گێچ؛ گیج: ۱. بەردەگێچ؛ سولفاتی کەلیسیومی ئاودار؛ بەردێکی سپی و نەرمی تۆلاش ـ تۆلاشە کە لە بوونە هەڵمی ئاوی خوێدار پەیدا دەبێ و بە نینۆک هەڵدەکرێ ۲. گەردەیەکی سپییە کە لە کولاندنی بەردەگێچ لە کوورەدا بەرهەم دێ و لە بەنایی و نەقاشی ماڵدا کەڵکی لێ دەگرن ۳. تەباشیر؛ گەچی نووسین 🇮🇷 ۱تا۳. گچ

⊡ **گەچ گرتن**: ۱. بە گەچ سواخ دان ۲. لە گەچ گرتن؛ ئەندامی شکاو لە ناو گەچدا بێ‌جوولە کردن 🇮🇷 ۱و۲. گچ گرفتن

**گەچ گرتنەوە**: گرتنەوەی هەویری گەچ 🇮🇷 گچ گرفتن

**گەچاو / geçaw**: ناو. ۱. ئاوەگەچی تراو ۲. نەخۆشییەکی چاو 🇮🇷 ۱. آب گچ رقیق ۲. از بیماری‌های چشم

**گەچبڕی / geçb(i)řî**: ناو. ۱. هونەر و لێزانی ڕازاندنەوەی دیوار و بن‌میچ بە نەخشی گەچی ‹لە گەچبڕیدا وەستا بوو› ۲. گەچکاری؛ نەخش و نیگاری بەرز و نزم بە گێچ ‹میچەکە گەچبڕییەکی جوانی هەبوو› 🇮🇷 ۱و۲. گچبری

**گەچران / geçran**: ☜ **گەچڵان**

**گەچکار / geçkar**: ناو. گێچکار؛ سپیکار؛ وەستای سواخ دانی دیوار بە گەچ ‹گەچکارمان هێناوە دیوارەکان گەچکاری بکا› 🇮🇷 گچکار

**گەچکاری / geçkarî**: ناو. ۱. گێچکاری؛ سپیکاری؛ کاری دیوار سواخ دان بە گەچ ‹سێ ڕۆژ کاری گەچکاریمان ماوە› ۲. ☜ **گەچبڕی ـ۲** 🇮🇷 ۱. گچکاری ۲. ☜ **گەچبڕی ـ۲**

**گەچڵ / geçł**: ئاوەڵناو. سیس؛ ژاکاو 🇮🇷 پژمُرده؛ پژولیده

**گەچڵان / geçłan**: چاوگ. گەچران؛ ژاکان؛ سیس و چرچ بوون 🇮🇷 پژمُرده شدن

**گەچڵاندن / geçłandin**: چاوگ. ژاکاندن 🇮🇷 پژمُرده کردن

**گەچۆڕ / geçoř**: ناو. شۆرەکات 🇮🇷 شوره‌زار

**گەچە / geçe**: ☜ **گەجە**

**گەچی / geçî**: ☜ **گەچین**

**گەچین / geçîn**: ئاوەڵناو. گەچی: ۱. لە گەچ چێکراو ۲. گەچ پێوە تلاو 🇮🇷 ۱. ساخته شده از گچ ۲. گچ‌آلود

**گەچینە / geçîne**: ناو. کانی گەچ 🇮🇷 معدن گچ

**گەخگەخ / gexgex**: ئاوەڵناو. میل ـ میل؛ ڕێ ـ ڕێ؛ خەت‌ـخەت 🇮🇷 راه ـ راه

**گەد / ged**: ناو. ۱. گە؛ گەی؛ ڕەوتی پێ‌چەقاندن و نەڕۆیشتنی حەیوان ۲. ☜ **گەدگ** ۳. زەوی پڕ لە کەندولەند ٤. ئاکار؛ ڕەوش 🇮🇷 ۱. گَە؛ امتناع حیوان از رفتن ۲. ☜ **گەدگ** ۳. زمین ناهموار ۴. اخلاق؛ منش

**گەدا**[1] **/ geda**: ناو. ۱. گدا؛ پارسەک؛ سواڵکەر؛ خوازەڵۆک ۲. *[مەجاز]* کچ؛ کەنیشک 🇮🇷 ۱. گدا ۲. دُختر

**گەدا**[2]: ئاوەڵناو. سواڵکەر؛ گدا؛ خوازەڵۆک 🇮🇷 گدا

**گەداخانە** / gedaxane/: ناو. گاخانە: ١. شوێنی ڕاگرتنی سواڵکەران ٢. *[پلار]* دامەزراوەی ڕووت و هەژار ☲ ١و٢. گداخانە

**گەداقۆز** / gedaqoz/: ناوەڵناو. تایبەتمەندی پارسەکی بەفیز کە خۆی بە خاوەنپارە شان دەدا ☲ ویژگی گدای لافزن کە ادعای ثروتمندی کند

**گەداندن** / gedandin/: چاوگ. پارسەکی/ دەرۆزە/ سواڵ کردن ☲ گدایی کردن

**گەدایی** / gedayî/: ناو. دەرۆزە؛ پارسەکی؛ سواڵکەری: ١. کار و ڕەوتی گەداندن؛ چاو لە دەستی ئەم و ئەو بوون بۆ بژیوی ژیان ٢. چلانە؛ سواڵ؛ پارسە؛ کاری سواڵکەر ☲ ١و٢. گدایی

**گەدک** / gedik/: ☜ **گەدگ**

**گەدگ** / gedig/: ناو. گەد؛ گەدک: ١. زگ و گەدە ٢. چێشتی لە گەد چێکراو ☲ ١. شکم و شکمبە ٢. غذای درست شدە از شکمبە

**گەدگر** / gedgir/: ☜ **گەدگیر**

**گەدگن** / gedgin/: ناوەڵناو. زگزل ☲ شکم‌گندە

**گەدگیر** / gedgîr/: ناوەڵناو. گەدگر: ١. تایبەتمەندی ئەسپێ کە لە ڕۆیشتن سەرپێچی دەکا ٢. *[پلار]* سەرسخت و پەلپگر ☲ ١. گُهگیر ٢. لجوج

**گەدگین** / gedgîn/: ناو. چێشتی پارچە عوور ☲ غذای سیرابی

**گەدوگیپاڵ** / ged û gîpał/: ناو. *[پلار]* زگ و سمتی زل پێکەوە ‹ئەو لە بەر ورگ و گەدوگیپاڵی پشووی لێ بڕابوو، من لە بەر کزی و بێهێزی هەر لاکەی سەرم دەهات! «هێمن»› ☲ شکم و باسن گُندە

**گەدووک** / gedûk/: ناو. ڕێباز بەقەدی کێودا؛ ڕێ بە گەوەدا ☲ راە از کمر کوە

**گەدە** / gede/: ناو. گەوەدە؛ گەدەق: ١. گادک؛ عوور؛ کیسەی ماسولکەیی نێو کۆئەندامی هەرسەک، لە نێوان زەنگلۆک و ڕیخۆڵەدا کە خۆراک دوای قووت دان دەڕژێتە ناوی ٢. ورگ؛ گرش؛ کرش؛ کەرش؛ مەشک؛ هێلگ؛ هێرک؛ ئاشک؛ هۆلمان؛ عوور؛ عووير؛ عویرگ؛ گیپاڵ؛ هووری؛ ئەشقەمە؛ گیە؛ گەڵە؛ یەکەمین و گەورەترین بەشی گەدەی کاوێژکەران ٣. لە ناوک بەرەژێر تا سەر ڕان ٤. *[مەجاز]* منداڵ؛ زارۆک ☲ ١. معدە ٢. شکمبە ٣. از زیر ناف تا سرِ ران ٤. بچە

**گەدەبەل** / gedebel/: ناوەڵناو. *[پلار]* سەرسخت و نەساز ☲ لجوج

**گەدەبەلی** / gedebelî/: ناو. *[پلار]* سەرڕەقی و نەسازان ☲ لجاجت

**گەدەفشە** / gedef(i)şe/: ناو. جۆرێ ماسی ☲ نوعی ماهی

**گەدەق** / gedeq/: ☜ **گەدە**

**گەدەک** / gedek/: ناو. پالاغی سێساڵە؛ بەچکە گامێشی سێ بەهار دیتە ☲ بچە گاومیش سە سالە

**گەدەوگودە** / gede w gude/: ناوەڵناو. دەلووقەل؛ گەجەرگوجەر ☲ لات و الوات

**گەدەوڵ** / gedewił/: ناوەڵناو. قۆڕ؛ قێرە؛ گون شۆڕەوەبوو ☲ فتقی

**گەدەوڵی** / gedew(i)łî/: ناو. قۆڕی ☲ بیماری فتق

**گەدەیەی** / gedeyey/: ☜ **گەدەیی**

**گەدەیی** / gedeyî/: ناو. گەدەیەی؛ زارۆکێتی؛ ڕۆژگاری منداڵی ☲ دوران کودکی

**گەر**[1] / ger/: ناو. ١. گە؛ جومگەی یەکسم ٢. بۆست؛ بست؛ بنگووس ٣. چک؛ قوێرەی جگ ٤. کونی دەستاڕی ئاش ☲ ١. مُچ ستور ٢. وجب ٣. گودی شتالنگ ۴. سوراخ دستاس آسیاب

**گەر**[2]: ئامراز. ١. ئەگەر؛ ئەیەر ٢. دەگەڵ؛ ڕەگەڵ ☲ ١. اگر ٢. همراە

**ـ گەر**[3]: پاشگر. پاشگری کرکاری: ١. ـکەر؛ کارکەر؛ خەریکی کارێک ‹کارگەر› ٢. ـ گێڕ؛ ـ وان؛ ـ

ڤان؛ پێکهێنەری شتێک ‹ئاسنگەر› ⇐ ١و٢. ـ گر

**گـەرا**[١] / gera/: نـاو. ١. تـۆمی وردی هێشتا نەگووراوی بێبزاوی جانەوەر و مێروو ٢. مارکە؛ ڕاوکەی مریشک ⇐ ١. تخم هنوز جان نگرفتەی حشرات و ماهی‌ها ٢. فال؛ تخمی کە زیر مرغ می‌گذارند

⊡ **گەرا خستن**: گـەرا دانـان؛ گـەرا نـان؛ تـۆم داخستنی مێروان ⇐ تخم گذاشتن حشرات

**گەرا دانان**: ☜ **گەرا خستن**

**گەرا نان**: ١. ☜ **گـەرا خستن** ٢. ڕاوکە ژێر کەرگی دانان ⇐ ١. ☜ **گەرا خستن** ٢. فال زیر مرغ گذاشتن

**گەرا**[٢]: ئاوەڵناو. بەرز و ئەستوور (بـۆ زگ دەگـوترێ) ⇐ ستبر و ورم‌کردە (شکم)

**گەراج** / gerac/: ☜ **گاراج**

**گەرادان** / geradan/: نـاو. ١. جێگـەی گـەرا تـێ کردن ٢. جێگەی خا لە زکی کەرگیدا ⇐ ١. جای تخمگذاری ٢. تخمدان مرغ

**گەراز** / geraz/: ☜ **گەراس**

**گەراس** / geras/: نـاو. گـەراز؛ هەڵـووچە زەردەی پاییزی ⇐ آلو زرد

**گـەراـ گـەرا** / gera gera/: ئاوەڵـکار. پەنـەماو؛ هەڵمساو ⇐ آماسیدە

⊡ **گەرا. گەرا وێستان**: بـەرزەوە بـوون؛ هاتنـە بـان ‹زگی گەراـ گەرا وێستاوە، لەوانەیـە زوو بـزێ› ⇐ بالا آمدن

**گەراماسی** / geramasî/: ناو. وڵتە ⇐ تُخم ماهی

**گەرانگە** / gerange/: ئاوەڵـکار. گەڕنگـە؛ جارێـک؛ هەڵێک؛ چەلێک ⇐ یک بار

**گەرت** / gert/: ناو. گەرد؛ تۆز و خۆڵ ⇐ گردوغُبار

**گەرجە** / gerce/: ئاوەڵناو. بێچارە؛ بەدبەخت ‹بە ئی کارەیلە ئاخری گەرجمان کەی› ⇐ بدبخت

**گەرچ** / gerç/: ☜ **گەرچی**

**گەرچە** / gerçe/: ☜ **گەرچەك**[١]

**گەرچەک**[١] / gerçek/: ناو. گەرچە؛ گـەن؛ گەنـەک؛ گەنەی؛ گێنە؛ کرچک؛ کەرچەک؛ کەلال؛ کرنگ؛ کرنی؛ کرنووک؛ کرنوو؛ گیایەکی گـەڵا پەنجـەی گوڵهێشووی میوە دڕکاوییە کە تۆمێکی چەوری هەیە و ڕۆنێکی تایبەتی لێ دەگرن ⇐ کرچک

**گەرچەک**[٢]: ئاوەڵناو. نیوە جووراو؛ تـەواو ورد نـەکراو ⇐ نیم‌کوب

**گەرچەکەکێویلە** / gerçekekêwîle/: ناو. گیایـەکی خۆڕسکە، دانەکەی لـە گەرچـەک بچـووکترە ⇐ گیاهی است

**گـەرچی** / gerçî/: ئـامراز. ئەگـەرچی؛ هەرچـەن؛ گەرچـە؛ گـەرچ؛ هەرچەنـدە؛ هـەرچن؛ دەگـەڵ ئەوەشدا ⇐ گرچە؛ با وجود

**گەرد**[١] / gerd/: نـاو. ١. گـەردە؛ ئـارد؛ بەرهـەمی وردی شـتی هـاڕدراو ٢. غومـار؛ تـۆز ٣. *[کنایە]* هیرۆیین ⇐ ١. پودر ٢. گَردوغُبار ٣. هروئین

**گەرد**[٢]: ئاوەڵناو. کەم؛ کەمووسکە ⇐ اندک

**گەرد**[٣]: ئامراز. وەگـەرد؛ دەگـەڵ؛ لەتـەک ‹کـەلای فەڕوخ خان لە دینەوەر تیەی/ ئوسا ئومید خان گەرد چوار خەر تیەی «شامی»› ⇐ با

**. گەرد**[٤]: پاشەوشە. گەڕ؛ گێڵ ‹چەپگەردی گـەردوون! گەڕان کوشتمی/ نـەزان‌پەرسـتی بـۆ نـان کوشـتمی «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ⇐ گرد

**گەردا** / gerda/: ئامراز. ئەگەر؛ ئەیەر ‹گەردا نـە ئـەز بووما› ⇐ اگر

**گەرداڤ** / gerdav/: ☜ **گێژاو**

**گـەرداڵ** / gerdał/: نـاو. تـۆزاڵ؛ تـوێژێکی ناسـک (وەک: بەفر یان تۆز و خۆڵی نیشـتوو) ‹گەرداڵـێ بـەفر باریوە› ⇐ لایە

**گەردان**[١] / gerdan/: ناو. ١. ڕەواج؛ بـرەو ٢. کـاری تـۆز کـردن ٣. *[ڕێزمان]* دۆخـی گـۆڕان و دەور و مانای تایبەت گرتنەخۆی وشە لە نـاو ڕسـتەدا ⇐

١. رواج ٢. عمل غُبار انگيختن ٣. تغيير حالت نحوى واژه در جُمله

**گەردان[٢]**: ئاوەڵناو. تۆزکەر ☰ غُبارانگيز

**ـ گـەردان[٣]**: پێشوشـە. ١. سـەبەبى گەڕانـدنـدوە ‹بەلاگەردان› ٢. گوێزەرەوە ‹ئاوگەردان› ☰ ١و٢. ـ گردان

**گەردانە[١]** / gerdane/: ☜ **گەردنبەند**

**گەردانە[٢]**: ئامراز. گەردا؛ ئەگەر ☰ اگر

**گەرداو** / gerdaw/: ☜ **گێژاو**

**گـەرداوى** / gerdawî/: ئاوەڵـناو. تـۆزاوى؛ تۆزلێنيشتوو ☰ گردآلود

**گەردبين** / gerdbîn/: ئاوەڵناو. تيـژ؛ زۆر بـە حـوکم (چاو) ☰ ريزبين (چشم)

**گەردش** / gerdiş/: نـاو. ١. ڕەوتى گەڕان ٢. ڕەوتى چەرخ دان ٣. گەردەش؛ ئـاژاوە و پشـێوى ☰ ١. گردش ٢. چرخش ٣. آشوب و بلوا

⊡ **گەردش نانەوە**: ئاژاوە نانەوە ☰ فتنه انگيختن

**گەردن** / gerdin/: ☜ **گەردەن**

⊡ **گەردن ئـازا کردن**: بەخشين لە کـارى ڕابـوردوو ‹گەردنم ئازا کـە! زۆرم زەحمـەت پـێ داوى› ☰ حلال کردن

**گەردنى کەسێ ورد بوون**: مل کەسێ شکيان؛ چـاو کەسێ دەرهاتن (تـووک) ☰ چشـم کسـى کـور شدن (نفرين)

**گەردنئـازادى** / gerdin'azadî/: ناو. گـەردنئـازايى؛ گـەردەنئـازادى؛ کـار و خـدەى لـە ڕابـوردووى کەسێک خۆش بوون ☰ طلب حلاليت

**گەردنئـازايى** / gerdin'azayî/: ☜ **گەردنئازادى**

**گەردنئەستوور** / gerdin'estûr/: ئاوەڵناو. ملقـەوى؛ ملپان: ١. خاوەن ملى پان ‹بە قەولى شێخەکانى گەردنئەستوور/ لە عەقل و مەعريفەت خۆتان مەکەن دوور! «قـانع»› ٢. *[پـلار]* دەسـەلاتدار ☰ ١و٢. گردنکلفت

**گەردنبەن** / gerdinben/: ☜ **گەردنبەند**

**گەردنبەنـد** / gerdinbend/: نـاو. گـەردنبـەن؛ گەردوان؛ گەردەنى؛ گەردانە؛ گەردنلغ ☰ گردنبند

**گەردنزەرد** / gerdinzerd/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* گـەردن و ژێرچەناکە جوان ☰ گردنافراشته و زيبا

**گەردنکـەچ** / gerdinkeç/: ئاوەڵـناو. ١. مـللار ٢. *[کيـنايـە]* لارەمـل؛ گـوێ بـە فـەرمان ٣. *[مـەجاز]* خەمگين و کز ☰ ١. گردنکج ٢. گوش به فرمـان ٣. غمگين

**گەردنگر** / gerdingir/: نـاو. گـەردنگير؛ کێشـە و بەلاى بەسەرهاتوو ☰ مُصيبت گريبانگير

**گەردنگير** / gerdingîr/: ☜ **گەردنگر**

**گەردنلغ** / gerdinliğ/: ☜ **گەردنبەند**

**گەردنورد** / gerdinwird/: ئاوەڵناو. *[دوعا]* ملشـکاو ☰ گردنشکسته

**گەردنە** / gerd(i)ne/: ☜ **گەردەنە**

**گەردوان** / gerdwan/: ☜ **گەردنبەند**

**گەردوخول** / gerd û xul/: ناو. کار و ڕەوتى گـەڕان و سووڕانەوە ‹گەردوخولێکى ناو گووگڵ بکە، شتێک دەدۆزيتەوە› ☰ عمل و فرايند پيرامون چيزى گشتن

**گەردوخۆڵ** / gerd û xoł/: ناو. تـۆز و خـۆڵ؛ تـۆز و غومار ☰ گردوغُبار

**گەردوگوڵ** / gerd û guł/: نـاو. دەمـى سـەرەتا ☰ سرآغاز

**گەردولول** / gerd û lûl/: ☜ **گێژەڵوکە**

**گەردوون** / gerdûn/: نـاو. ١. زەمانە ‹نرخى هونـەر و جوانييە دەبيا گەردوون/ کێ پێکەنى جارێکى، هـەزار جـار گريـا «هـەژار، *چوارينـەکانى خـەييام*»› ٢. چـەرخى ئـاو لـە چـەم هەڵـێنجان ٣. تەگـەرە عەڕابەى زل ☰ ١. زمانه ٢. ناعور؛ چرخ چاه ٣. چـرخ ارادەى بزرگ

**گـەردوونـە** / gerdûne/: نـاو. چـەرخوفەلـەک؛ ماينچەقەڵ ☰ چرخفلک

**گەردە**[1] / gerde/: ناو. ١. ڕیزەگولـینگەی ڕەشـی ئاوریشمی کە لە سەری دەپێچن ٢. ☜ **گەردەن** ٣. خاکەڕەژی ٤. هەلالە؛ گەرک؛ تـۆوی (گانـەی نێری) گیا کە بـە دەم بـاوە دەچـێ ☰ ١. زنجیـرە منگولەی ابریشمی مشکی ٢. ☜ **گەردەن** ٣. خاکـە زغال ۴. گردەی گیاه

**گەردە**[2]: ئاوەڵناو. کورتەبالای قەڵەو ☰ کوتاەقد چاق

**گەردەبا** / gerdeba/: ☜ **گێژەڵووکە**

**گەردەبل** / gerdebil/: نـاو. ١. ☜ **گێژەڵووکـە** ٢. لوولەی خوار وەک لووتەفیل ☰ ١. ☜ **گێژەڵووکە** ٢. لولەی خرطومی

**گەردەپژێنی** / gerdep(i)jênî/: نـاو. هەلالـەپڕژێ؛ گەردەشانی ☰ گردەافشانی

**گەردەتـووچان** / gerdetûçan/: نـاو. گەردەچویچـە؛ گەردەگووچان؛ باهۆز؛ گەردەلوو ☰ گردباد

**گەردەچویچە** / gerdeç(i)wîçe/: ☜ **گەردەتووچان**

**گەردەش** / gerdeş/: ☜ **گەردش-٣**

▣ **گەردەش گێڕان:** ئاژاوە نانەوە ☰ فتنە برپا کردن

**گەردەشانی** / gerdeşanî/: ☜ **گەردەپژێنی**

**گەردەگووچان** / gerdegûçan/: ☜ **گەردەتووچان**

**گەردەلوو** / gerdelû/: ☜ **گەردەتووچان**

**گەردەلوور** / gerdelûr/: ☜ **گێژەڵووکە**

**گەردەلوول** / gerdelûl/: ☜ **گێژەڵووکە**

**گەردەمل** / gerdemil/: نـاو. پێشـەی گـەردن ☰ استخوان گردن

**گەردەن** / gerden/: ناو. مـل؛ گـەردن؛ گـەردە: ١. هەفک؛ هەستۆ؛ هەسـتو؛ هسـتو؛ ئەسـتۆ؛ سـتۆ؛ قەرپک؛ خـەن؛ ئـەوک؛ بەشـێک لـە جەسـتەی گیانداران کە لە نێوان سـەر و لەشـدایە ٢. ملـە؛ ملکە؛ بەشی باریکەلەی نێوان زارک و سکی دەفر ☰ ١. گردن ٢. مدخل باریک ظروف

**گەردەنئازادی** / gerden'azadî/: ☜ **گەردنئازادی**

**گەردەنبەنـد** / gerdenbend/: نـاو. ملوانکـە ☰ گردنبند

**گەردەنسـوور** / gerdensor/: نـاو. باڵـندەیەکی ملسوورە ☰ پرندەای با گردنِ قرمز

**گەردەنگۆ** / gerdengo/: ناو. جۆرێ خشڵی گەردن ☰ نوعی زیور گردن

**گەردەنـە** / gerdene/: نـاو. گەردنـە؛ ملـە؛ کـەل؛ بستوو؛ زینوو؛ ڕێگای لێژ و پێچەڵپێچ لە پاڵداوێن تا سەر یاڵی کێو ‹تەریدەی هیجران بەیدای جیایی/ گرتـەن گەردەنـەی ڕای ئاشـنایی «مەولـەوی»› ☰ گردنە

**گەردەنی** / gardenî/: ☜ **گەردنبەند**

**گەردەنیش** / gardenîş/: ناو. پشـوو؛ لەسـەرخۆیی؛ سەبر و حەوسەلە ☰ متانت

**گەردیان** / gerdyan/: چاوگ. لار بوونـەوە ☰ کـج شدن

**گەردیلـە**[1] / gerdîle/: نـاو. ١. کـاری تەکانـدنی کەلپەلی ماڵ ٢. زەڕڕە؛ بەشـی زۆر ورد لـە هـەر ماکێ ☰ ١. خانەتکانی ٢. ذرّە

**گەردیلە**[2]: ناو. زۆر چکۆلە ☰ ریز

**گەردین**[1] / gerdîn/: چـاوگ. گـەڕان؛ گـەڕیان ☰ گردش کردن

**گەردین**[2]: ☜ **گردین**[1]

**گەرزک** / gerzik/: ناو. ١. ئالقە؛ خەلەک ٢. کـاری کۆز کردن؛ کۆ بوونەوە و ئالقەبەستنی خەڵک ☰ ١. حلقە ٢. گردهم‌آیی و حلقە زدن مردم

**گەرس** / gers/: نـاو. کـرس؛ گـەرش؛ زبـڵوزاڵ ☰ آت‌وآشغال

**گەرسـاندن** / gersandin/: چـاوگ. گەوزانـدن؛ تێکەوە دان و گلاندن ☰ بر پهلو غلتاندن

**گەرس و گێڵ** / gers û gêl/: ☜ **گەرش و گێڵ**

**گەرسین** / gersîn/: چاوگ. گەوزین ☰ غلتیدن

**گەرش** / gerş/: نـاو. پـووش؛ وردە لاسـکی گیـا ☰ خاشاک

**گەرش‌وگێڵ** / gerş û gêł/: ناو. گەرس‌وگێڵ؛ پووش‌وپەلاش ☰ خس و خاشاک

**گەرک** / gerk/: ناو. شوولی داری گەز ☰ ترکەی چوب گز

**گەرک** / gerik/: ناو. تۆمی بار هێناوی میوە کە بە جانەوەرەوە دەنووسێ ☰ گردەی گُل

**گەرگو** / gergû/: ☜ **گورچیلە**

**گەرگووش** / gergûş/: ناو. لانک؛ بێشکە؛ دەرگووش ☰ گهوارە

**گەرگوونک** / gergûnik/: ناو. تۆقی مل؛ قەلادە ☰ قلادە؛ طوق گردن

**گەرگەر** / gerger/: ناو. بەردەلان ☰ سنگلاخ

**گەرگەری** / gergerî/: ناو. هەندۆک؛ بسکویت ☰ بیسکویت

**گەرگەسان** / gergesan/: چاوگ. ١. وردوخاش بوون ٢. وەبەر هەرەس کەوتن ☰ ١. خُرد و خاکشیر شدن ٢. در مسیر بهمن افتادن

**گەرگەساندن** / gergesandin/: چاوگ. ١. وردوخاش کردن ٢. پسانی ڕنوو ☰ ١. خُرد و خاکشیر کردن ٢. ریزش کردن بهمن

**گەرلک** / gerlik/: ☜ **گەزلك**

**گەرم**[١] / germ/: ناوەڵناو. ١. بەتین؛ بەتاو؛ تاودار؛ بە هۆی خۆر، ئاور یان کارەباوە تین‌گرتوو ‹دیوی گەرم› ٢. گەرم‌کەرەوە ‹جلی گەرم› ٣. *[کینایە]* بەکار ‹گەرمە لە کاردا› ٤. *[مەجاز]* سەرقاڵ؛ سەرگەرم؛ خەریک ‹گەرمی قسە بووم، لە زەنگیان دا› ٥. بەتین و تاو ‹بازاڕیان گەرمە› ٦. بە تینێکی زیاتر لە ڕادەی ئاسایی ‹هەوای گەرم› ٧. *[مەجاز]* دلگر؛ نەرم؛ دڵنشین ‹دەنگی گەرم و خەیاڵاوی کەریم کابان› ٨. *[مەجاز]* گەرم و گوڕ؛ زۆر نزیک ‹پێوەندییەکی گەرم و نزیک› ٩. دۆستانە ‹دەستی گەرمی ئاشنا نییە کە ئەیگوشم/ دەستی چێوییە «سوارە»› ☰ ١و٢. گرم ٣. کاری؛ فعال ٤. سرگرم ٥. پُر رونق ٦تا٨. گرم ٩. صمیمی

⊡ **گەرم بوون:** گەرم داهاتن؛ گەرم ڕاهاتن: ١. تین تێ‌گەڕان؛ گەرم دابوون ٢. *[مەجاز]* بە توندی وە کار کەوتن ‹گەرمی دەرس خوێندن بووم› ☰ ١. گرم شدن ٢. سخت سرگرم کار شدن

**گەرم بوونەوە:** پاش سەرما بوون تینی گەرما تێ‌گەڕان. هەروەها: **گەرم کردنەوە** ☰ گرم شدن بعد از سرما

**گەرم دابوون:** ☜ **گەرم بوون ـ١**

**گەرم داگرتن:** ☜ **گەرم گرتن**

**گەرم داهاتن:** ☜ **گەرم بوون**

**گەرم ڕاهاتن:** ☜ **گەرم بوون**

**گەرم کردن:** ١. تینی خۆر و ئاگر لە شتی سارد دان و گۆڕاندنی ٢. *[مەجاز]* خۆش کردنی کۆڕ لە لایەن قسەخۆشەوە ☰ ١. گرم کردن ٢. آراستن و گرم کردن مجلس

**گەرم گرتن:** *[مەجاز]* گەرم داگرتن؛ پێوەندی زۆر نزیک دامەزراندن؛ تێکەڵ بوون و جۆشان لەگەڵ خەڵکدا ‹بڕواتە هەر کوێ، نامۆیی ناکا و لەگەڵ خەڵکا گەرم ئەگرێ› ☰ گرم گرفتن

**- گەرم**[٢]: پاشەوشە. ـ قاڵ ‹سەرگەرم؛ دڵگەرم› ☰ ـ گرم

**گەرما** / germa/: ناو. گێرما؛ تینی خۆر و ئاگر و ... ☰ گرما

⊡ **گەرما بردن:** تینی تاو بردن ☰ گرمازدە شدن

**گەرمابردوو** / germabirdû/: ناوەڵناو. گەرمابردە؛ تاوبردوو ☰ گرمازدە

**گەرمابردە** / germabirde/: ☜ **گەرمابردوو**

**گەرمابەر** / germaber/: ناوەڵناو. بە تایبەتمەندی بردن و ڕاگوێزانی گەرماوە ☰ گرمابر

**گەرماپێدا** / germapêda/: ناو. *[کینایە]* مانگی جۆزەردان ☰ خُرداد ماه

**گەرماپێو** / germapêw/: ناو. قیرات؛ ئامرازی

شاندانی پلەی گەرما و سەرما ▬ دماسنج

**گەرماتی** / germatî/: ناو. گەرما؛ تین ▬ گرمی

**گەرماخ** / germax/: ناو. ١. گەمار؛ چڵک و چەپەڵی ٢. ئارەقەی بن هەنگڵ و قاچ ▬ ١. چرک و کثافت ٢. عرق زیر بغل و کشالەی ران

**گەرماخژن** / germaxijin/: ناوەڵناو. چڵکن؛ چەپەڵ ▬ چرکین؛ کثیف

**گەرماخن** / germaxin/: ناوەڵناو. پیس و پۆخڵ ▬ کثیف و زشت

**گەرماژۆ** / germajo/: ناوەڵناو. گەرماژەک؛ گەرمابردوو؛ گەرمابردە؛ گەرماگەز؛ شەرابردوو؛ شەرابردە ▬ گرمازده

**گەرماژەک** / germajek/: ☜ گەرماژۆ

**گەرماڤ** / germav/: ☜ گەرماو

**گەرماگە** / germage/: ☜ گەرماو-١

**گەرماگەز** / germagez/: ☜ گەرماژۆ

**گەرماندن** / germandin/: چاوگ. گەرم کردن ▬ گرم کردن

**گەرمانی** / germanî/: ☜ گەرمێن

**گەرماو** / germaw/: ناو. گەرماڤ: ١. گەرماگە؛ گەرماوە؛ حەمام ٢. گراو؛ چاوەی ئاوی گەرم ▬ ١. گرمابه ٢. چشمەی آب گرم

**گەرماوگەرم**[١] / germawgerm/: ناو. جەنگە و ناوەند ‹لە گەرماوگەرمی شەڕدا پەیدا بوو› ▬ گرماگرم

**گەرماوگەرم**[٢]: ناوەڵکار. دەسبەجێ؛ بێدرەنگ ‹گەرماوگەرم گەیشتە سەری› ▬ گرماگرم

**گەرماوە** / germawe/: ☜ گەرماو-١

**گەرماوی** / germawî/: ناو. چێشتی شلەی وردەساوار ▬ آش بلغور

**گەرماهی** / germahî/: ناو. تین؛ تەوژمی گەرما ▬ گرمی

**گەرمایی**[١] / germayî/: ناو. گەرمی؛ تین ‹تا گەرمایی ژین ماوە شادی کەم/ ئیتر واز بێنم لە ئاشنایی خەم «گۆران»› ▬ گرمی

**گەرمایی**[٢]: ناوەڵناو. گەرمن؛ لاواز و بەرگەنەگر لە بەر گەرما ▬ گرمایی

**گەرمبازاڕی** / germbazaȓî/: ناو. بازاڕگەرمی؛ بازارتیژی ▬ بازارگرمی

**گەرمچەک** / germ(i)çek/: ناو. جومگەی دەست ▬ مُچ دست

**گەرمخان** / germ(i)xan/: چاوگ. گەرمخین: ١. داهێزان؛ لە گەرمان وەڕەز بوون ٢. وشکەوە بوون لە بەر گەرما ▬ ١. گرمازده شدن ٢. خشک شدن از شدت گرما

**گەرمخاندن** / germ(i)xandin/: چاوگ. ١. تەوژم هێنانی گەرما ٢. وشکەوە کردن لە بەر تینی گەرما ▬ ١. شدت گرفتن گرما ٢. خشک کردن با گرما

**گەرمخانە** / germxane/: ناو. ئاگرخان ▬ گُلخن

**گەرمخواز** / germx(i)waz/: ناوەڵناو. زۆر لەسەرهەست ▬ بسیار حسّاس

**گەرمخین** / germixîn/: چاوگ. ١. ☜ گەرمخان ٢. بۆن گرتن لە بەر گەرمای زۆر ▬ ١. ☜ گەرمخان ٢. گندیدن از گرما

**گەرمداهاتو** / germdahatû/: ناوەڵناو. شارپای ▬ گرمشده

**گەرمژ** / germij/: ناو. ١. ☜ گەرمژە ٢. گەرمیان ▬ ١. ☜ گەرمژە ٢. گرمسیر

**گەرمژاندن** / germ(i)jandin/: چاوگ. گەرمژین؛ لە بەر گەرما تووشی تاو و یاو هاتن ▬ تب کردن از گرما

**گەرمژمێر** / germj(i)mêr/: ناو. گەرماپێو ▬ گرماسنج

**گەرمژۆک** / germ(i)jok/: ناو. زیپکە لە تاوانگازییەوە ▬ جوش ناشی از تابش آفتاب

**گەرمژە** / germ(i)je/: ناو. گەرمژ؛ گەرمەژن؛ گەرمەژنە؛ زیپکە لە تاو بردنەوە ☰ جوش از آفتابزدگی

**گەرمژین** / germ(i)jîn/: ☜ گەرمژاندن

**گەرمسێر** / germsêr/: ☜ گەرمێن

**گەرمش** / germiş/: ناو. تەوژم ☰ فشار

**گەرمشاندن** / germ(i)şandin/: چاوگ. تەوژم دان؛ زۆر بۆ هێنان ☰ فشار آوردن

**گەرمشتە** / germişte/: ناو. برێشکە ☰ دانەی بودادە

**گەرمشک** / germişk/: ناو. تێمیسک ☰ تبخال

**گەرمک** / germik/: ناو. ١. جۆرێ برنج ٢. گرکە؛ حەنجۆر ٣. ژانی بەندی ڕان ٤. گەرمکە؛ سەرچاوەیەک کە لەچاو دەوروبەری، هاوینان ساردە و بە زستان گەرم ٥. قاتوقەیماخی؛ نیوەنمەکی گەرم بۆ سەر کوان ☰ ١. نوعی برنج ٢. گرمک ٣. درد مفصل ران ۴. چشمەای کە آبش بە نسبت، در زمستان گرم و تابستان سرد است ۵. خمیر پُرنمک گرم کە بر دُمل گذارند

**گەرمکاو** / germkaw/: ☜ گراو[1]

**گەرمکە** / germke/: ناو. ١. ئاوی گەرمی کانیاو ٢. گەرماوی کانی بێ گەرم کردنی مرۆ ☰ ١. چشمەی آب گرم ٢. گرمابەی طبیعی

**گەرملەینە** / germ(i)łeyne/: ناو. کەشکەک؛ چێشتی گەنمەکوتاو ☰ آش گندم نیمکوب

**گەرمن**[1] / germin/: ناو. گەرما ☰ گرما

**گەرمن**[2]: ناوەڵناو. گەرمایی ☰ گرمایی

**گەرموگوڕ**[1] / germ û guř/: ناوەڵناو. بەتین؛ پڕهەست ‹هەستێکی گەرموگوڕ› ☰ پُرحرارت

**گەرموگوڕ**[2]: ناوەڵکار. گەرموگوڕانە؛ بەگیان و دڵ ‹گەرموگوڕ بەخێراتنی لێ کردین› ☰ با حرارت

**گەرموگوڕانە** / germ û guřane/: ☜ گەرموگوڕ[2]

**گەرمۆ** / germo/: ناو. گەرماو؛ ئاوی گەرمی کانی ☰ آب گرم چشمە

**گەرمۆک** / germok/: ناو. ١. ☜ گەرمێن ٢. گەرمای پێویست و بە ئەندازە ☰ ١. ☜ گەرمێن ٢. گرمای مناسب

**گەرمووک** / germûk/: ناو. گەرمک؛ سەرچاوەی ئاوی گەرم ☰ چشمەی آب گرم

**گەرمە**[1] / germe/: ناو. ١. جەنگە ‹لە گەرمەی شەڕا گاڵتەی ئەکردا› ٢. چەڵتووکێ کە زووتر پێ دەگا ٣. شۆربا؛ شۆروا ☰ ١. عنفوان ٢. شالی زودرس ٣. شوربا

**گەرمە**-[2]: پێشوشە. بەکار؛ تازە و زیندوو ‹گەرمەبرین؛ گەرمەخول؛ گەرمەشین› ☰ تازە؛ فعال

-**گەرمە**[3]: پاشەوشە. بەتین ‹خۆرەگەرمە› ☰ گرم

**گەرمەبرین** / germeb(i)rîn/: ناو. تازەبرین؛ برینێ کە هێشتا سارد نەبۆتەوە و خوێنی لێ دێ ☰ زخم تازە

**گەرمەبۆق** / germeboq/: ناو. بۆخی گەرم ☰ بُخار گرم

**گەرمەپەرێز** / germeperêz/: ناو. جارە گەنمێ کە تازە دروێنە کرابێ ☰ گندمزاری کە تازە درو شدە باشد

**گەرمەتەندوور** / germetendûr/: ناو. نانی تەندوورێ کە هێشتا گڕی تەواو دانەمرکاوە ☰ نان تنور هنوز خاموش نشدە

**گەرمەخول** / germexul/: ناو. ١. ڕەوتی سووڕانی بەرداش بە پەلەپەل ٢. کایەیەکە ☰ ١. چرخش با شتاب آسیاب ٢. از بازیها

**گەرمەژن** / germejin/: ☜ گەرمژە

**گەرمەژنە** / germej(i)ne/: ناو. ١. ☜ گەرمژە ٢. چۆنیەتی تینی تاو بردن ☰ ١. ☜ گەرمژە ٢. گرمازدگی

**گەرمەسووت** / germesût/: ناو. جۆرێ پارچەی تەنک ☰ نوعی پارچەی نازک

**گەرمەسێر** / germesêr/: ناو. گەرمیان؛ گەرمێن؛

گەرمەسێری؛ ناوچەگەلی گەرم ‹بۆخۆم تیر و یارم تیـر، گرمەسـێر، هـەی گەرمەسـێرا «فولکلـۆر»› 🇮🇷 گرمسیر

**گەرمەسێری** / germesêrî/: ☜ **گەرمەسێر**

**گەرمەشامی** / germeşamî/: ☜ **گەنمەشامی**

**گەرمەشانی** / germeşanî/: ☜ **گەنمەشامی**

**گەرمەشین** / germeşîn/: نـاو. شـەپۆڕی زۆر بـە تەوژم و بە کوڵ 🇮🇷 شیون و زاری شدید

**گەرمەک** / germek/: نـاو. ١. دەم ئـاوێ کـە بـە زستانی نایبەستێ ٢. گرکە 🇮🇷 ١. کنار آب‌های گرم که زمستان یخ نمی‌بندد ٢. گرمک

**گەرمەکەش** / germekeş/: نـاو. کـار و ڕەوتی چاندنی بێستان و زەرعات لە گەرمای بەهاردا 🇮🇷 کاشت جالیز در گرمای بهار

**گەرمەگڵ** / germegił/: نـاو. کـار و ڕەوتی دەم لێکدانی بێ وچان و ڕاوەستان 🇮🇷 جرّافی؛ عمل فک زدن بدون وقفه

**گەرمەگۆڕ** / germegoř/: نـاو. کـاری چێشـت بەخشین بۆ تازە مردوو 🇮🇷 عمل غـذای نـذری بـه مناسبت فوت کسی بخشیدن

**گەرمەلان** / germelan/: نـاو. ١. لانـەی تـازە دروستکراو ٢. لانەیێ کـە تـازە کەروێشـکی لـێ هەستابێ 🇮🇷 ١. لانەی تازەساخت ٢. لانه‌ای که تازه خرگوش از آن جسته باشد

**گەرمەلۆک** / germelûk/: ناو. بێـروون؛ دەشـتی گەرم و بێ ئاو 🇮🇷 صحرای گرم بی آب

**گەرمەڵە** / germełe/: نـاو. کـانی گـەرماو 🇮🇷 چشمه‌ی آب گرم

**گەرمەوزە** / germew(i)ze/: ناو. گەرمەوەزە؛ تین و قەوەتی گەرما 🇮🇷 شدت گرما

**گەرمەوەر** / germewer/: ناوەڵناو. شۆرباهەڵـقوڕێن؛ شۆربافرکەر 🇮🇷 آش‌آشام

**گەرمەوەزە** / germeweze/: ☜ **گەرمەوزە**

**گەرمی**[1] / germî/: ناو. ١. گەرمایی؛ گەرمێتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی گەرم بوون ‹گەرمی و تـەڕی بـەهارە کە پشکۆ کوژایەوە/ پشکۆی گولاتەشین بە نەسیم بوو گەشـایەوە «نـالی»› ٢. گـوڕ و تـین لـە کـاردا ٣. [مەجاز] دۆستایەتی و مێری و چێری ‹بـە گـەرمی بـەرەو پیریمـان هـات› ٤. [مەجاز] بـرەو؛ ڕەونـەق ‹گـەرمی بـازار› ٥. بـە گـوێرەی بژیشـکی کـۆن، تایبەتمەندی برێ خۆراک کە گەرمای لـەش زۆر دەکەن و دەبنە هۆی دەرکردنی زیپکە و کوان و برێ نەخۆشی تر ٦. گەرما؛ تین؛ تاو ‹وەرە گیـانم فیدای چاوی ڕەشی تۆ/ وەرە با هەست بکەم گـەرمی لەشی تۆ «هێمن»› 🇮🇷 ١. گرمـی ٢. حـرارت در کـار ٣تا٥. گرمی ۶ حرارت

▪ **گەرمی**[2]: پاشەوشە. دۆخی گەرم بـوون ‹دڵـگەرمی؛ دەسگەرمی› 🇮🇷 ـ گرمی

**گەرمیان** / germ(i)yan/: ☜ **گەرمێن**

**گەرمیاندن** / germ(i)yandin/: چاوگ. بووژاندنەوە؛ باش وە سەر کار خستن 🇮🇷 سرگرم کردن به کار

**گەرمیانی** / germ(i)yanî/: ☜ **گەرمێتی**

**گەرمێتی** / germêtî/: ☜ **گەرمی**[1]

**گەرمێن** / germên/: نـاو. گـەرمانی؛ گـەرمۆک؛ گەرمیان؛ گەرمسێر؛ گەرمەسێر؛ گەرمژ؛ شـوێن و مەڵبەندێ کە گەرمای بۆ ژوور ٤٠٠ هەڵدەکشـێ ‹پەلەوەرەکان بەرەو گەرمێن بوونەوە› 🇮🇷 گرمسیر

⊡ **گەرمێن و کوێستان کردن**: ١. ئـێلاخ و قشـلاخ کردن؛ کۆچەر بوون ٢. [کینایە] هاموشۆی زۆر لـە نێوان دوو شوێندا کردن 🇮🇷 ١. یـیلاق ـ قشـلاق کردن ٢. رفت و آمد بسیار داشتن

**گەرمێنی** / germênî/: ناوەڵـناو. گـەرمیانی؛ گەرمەسێری؛ سەر بە گەرمانی ‹هەوای گەرمێنی› 🇮🇷 گرمسیری

**گەرن** / gerin/: ناوەڵناو. گەڕۆڵ 🇮🇷 گر شده

**گەرنگ** / gering/: ناو. گیایەکە 🇮🇷 گیاهی است

**گەروانکە** / gerwanke/: ☜ **گروانکە**

**گەروی** / gerwî/: ☜ **گەرو ـ١**

**گەرۆ** / gero/: ☜ **گەرو ـ١**

**گەرو** / gerû/: ناو. گەرووی؛ گەڵوو؛ گەلوو: ١. گلب؛ گلوێ؛ گەوری؛ گەرۆ؛ گەروی؛ گلوی؛ گەلی؛ هەوک؛ هەوگ؛ قورگ؛ قرگ؛ قوری؛ قورێ؛ قوروو؛ قورووگ؛ قوروتگ؛ قوریتگ؛ ناق؛ خووز؛ حەفک؛ حەڵق؛ ئوک؛ بین؛ ناقرێ؛ ناقرە؛ ناخرە؛ برناق؛ ڕیقناسە؛ تەشنی؛ تینی؛ تینگ؛ تینو؛ خەلالووک؛ گەلەلووک؛ خرناک؛ گلوە؛ گلوەزێ؛ ئەندامێ کە دەم بە لوولەی زەنگلۆکەوە دەلکێنێ ٢. گلب؛ گلوێ؛ گەوری؛ بەرمل؛ لوولە؛ باریکەڕێی نێوان زارک و سکی هەر شتێک ‹گەرووی ئاسیا› ٣. ملە؛ کەل ☰ ١. گلو ٢. هرچیز گلومانند ٣. گردنه

⊡ **گەرو گیران**: ١. شت دە گەروودا قەتیس بوون ٢. دەنگ کەوتن ☰ ١. در گلو پریدن ٢. گرفتن صدا

**گەرو هاتن**: ئالوو هاتن ☰ ملتهب شدن لوزه

**گەرو هێنانەوە**: چارەی ئالوو کردن ☰ لوزتین را مُعالجه کردن

**گەروخرە** / gerûx(i)ře/: ناو. ڕەوتی گەروو هاتن ☰ ورم لوزه

**گەرووز** / gerûz/: ئاوەڵناو. زبر؛ گرس؛ زووز؛ زرو ☰ زبر؛ خشن

**گەرووزی** / gerûzî/: ناو. ١. زبری؛ زرووی ٢. گرسی ☰ ١. زبری ٢. خشونت

**گەرووشە** / gerûşe/: ناو. گرسی؛ ڕکهەستاوی ☰ عصبانیت

**گەرووشینە** / gerûşîne/: ناو. باڵندەیەکە لە تۆرەمەی ڕەشیشە، لە کۆتر بچووکترە، کلکی پان دەکاتەوە و هەڵیدەتەکێنێ، نێرە بەهاران ملی شین دەنوێنێ، زستانان زۆر دەبینرێن ☰ گلو آبی

**گەرووگر** / gerûgir/: ☜ **گەڵوگر**

**گەرووی** / gerûy/: ☜ **گەرو**

**گەرە**[1] / gere/: ناو. گەرووی بەرداش؛ کونی بەرداشی سەرەوە ☰ گلوی سنگ آسیاب

**گەرە**[2]: ☜ **گەرەك**[2]

**گەرەک**[1] / gerek/: ↓

⊡ **گەرەک بوون**: ویستن: ١. خواستن؛ هەرەک بوون ‹زۆرم لە خودا ویست و کەمیشی نەگەییشت/ هەر تۆبەیە دەمداتێ ئەویش نەمگەرەکە! «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ٢. بەنیازی کردنی کارێک بوون ‹ـچیت گەرەک؟ ـگەرەکمە بچم› ☰ ١. خواستن ٢. قصد کردن

**گەرەک**[2]: ئاوەڵکار. گەرە؛ گەرەکە؛ پێویستە؛ ئەبێ؛ ئەشێ ‹گەرەک لە هەموو شێوەکان، زمانزانانی لەزەبر کۆ بینەوە و کۆڕ ببەستن «هەژار، *هەنبانەبۆرینە*»› ☰ باید؛ لازم است

**گەرەکناگەرەک** / gereknagerek/: ئاوەڵکار. خوایینەخوایی؛ بتەوێ ـنەتەوێ؛ چاریناچار ☰ خواهناخواه

**گەرەکە** / gereke/: ئاوەڵکار. پێویستە؛ پێویسە؛ دەخوازێ؛ دەبێ ‹گەرەکە تۆیش بی؛ گەرەکە وشیار بین› ☰ لازم است

**گەرەنتی** / gerentî/: ☜ **گارانتی**

**گەرەنگ**[1] / gereng/: ناو. دارێکی دوو پەلە تا پەلکی تفاقی لە سەر دادەمەرزێنن ☰ چوبی دوسر کە تودەی برگ علفی را بر آن نهند

**گەرەنگ**[2]: ئاوەڵناو. گرینگ؛ گرنگ ☰ مُهم

**گەرەنگ**[3]: ئاوەڵکار. جارێک؛ کەڕەتێک ☰ یکبار

**گەرەو** / gerew/: ناو. بارمتە ‹با لە گەرەوێ تەدا بە، تا دەبینی خۆ ددم تە› ☰ رهن

**گەرەوتش** / gerewtiş/: چاوگ. کڕین؛ سەنن؛ سەندن ☰ خریدن

**گەرەویلک** / gerewîlik/: ناو. وشەگ؛ گوێڕەش؛

جانەوەرێکە لە تیرەی ڕێوی بە کەوڵی بەنرخەوە وشق

**ـ گەری / gerî/**: پاشگر. ـــ کـەری: ١. ـ کـاری؛ ـ بـازی؛ پاشـگری خـاوەن بـوون ‹توانگـەری› ٢. کـردنی کارێـک یـان هـەبوونی پیشـەیەک ‹کاریگەری› ٣. دروستکردن یان کار کـردن بـە شتێک ‹ئاسنگەری› ١تا٣. ـ گری

**گەڕ[1] / geř/**: ناو. ١. فـێڵ و گـزی ‹گـەڕبازە ڕاسـت نییە› ٢. تەشقەڵە؛ شڵتاغ ‹گەڕی تێهاڵاندووم› ٣. ڕەواج؛ برەو ٤. چەرخ؛ خـول ‹دوێنـێ لـە داوەتی کاکی خۆ، لە گەڕی دیلانێ پشتێنم شـل بـوو، لەبـەر خۆ بـادان و هـاتوچوویـە «پـایزە»› ٥. تەپۆڵـکەی بـەردین ٦. سەرسـەختی و لاسـاری ٧. گـروێ؛ گەڕی؛ نەخۆشییەکە ٨. گۆڕایی؛ تەختایی (زەوی) ٩. نۆرە؛ نۆگە ١٠. گێژاوی گـۆم ١١. مـزراح ١٢. خولخولە ١٣. سەدە؛ چەرخ؛ خـولێکی زەمانـە ١. حیله ٢. شلتاق ٣. رواج ۴. گردش؛ جریان ۵. تپه‌ی سنگی ۶. لجاجت ٧. بیماری گری ٨. همواری (زمین) ٩. نوبت ١٠. گرداب ١١. گردنا ١٢. فرفره ١٣. قرن

⊡ **گەڕ پێکردن**: ☜ **گەڕ تێهاڵاندن**

**گەڕ تێهاڵاندن**: گـەڕ پـێکـردن؛ شـەڕ پـێ فرۆشتن؛ تووشی شـەڕ کـردن درگیـر نـزاع کردن

**لە گەڕدا بوون**: ١. بەبرەو بوون ‹بازاڕی هێلکە لـە گەڕدایە› ٢. بوونە داب ٣. لـە حالـی گـەڕان و کار کردندا بوون ‹ڕۆژ و ئەرز و مانگ وا لە گەڕایە/ تۆش تێبکۆشە تا هێزت تیایـە «بێکـەس»› ١. رواج داشتن ٢. مُد شدن ٣. در کار بودن

**بە گەڕ کەوتن**: گەوتنـە گـەڕان؛ وەکارکـەوتن ‹جێی ئیفتیخارە بۆت لە بەر کەی فەرەنجی مـەڕ/ پارەی ولاتەکەت لە ولاتا بە گەڕ کەوێ «قانع»› به جریان افتادن؛ رواج یافتن

**گەڕ[2]**: ناوەڵناو. گەڕۆڵ؛ گرووو؛ کرووز؛ گـول؛ گـروێ گَر؛ مبتلا به گال

⊡ **گەڕ بوون**: تووشیاری نەخۆشی گەڕی بـوون گر شدن

**ـ گەڕ[3]**: پاشەوشە. بگەڕ؛ لە گەڕان ‹دنیاگەڕ؛ ماڵانگەڕ› ـگرد

**گەڕا / geřa/**: ئاوەڵناو. تایبەتمەنـدی کەسـێ کـە زۆرتر لە ڕۆیشتندایە و کـەمتر ئـارام دەگـرێ سیّار

**گەڕاڤ / geřav/**: نـاو. گۆمی قووڵ کە ئاوەکەی بـە تەندوورەیە و خول دەخوا گردابه‌ی ژرف آب

**گەڕاڵ / geřał/**: ئاوەڵناو. گەڕیـدەی بـێمەبەسـت ‹لاتی گەڕاڵ› هرزه‌گرد بی‌هدف

**گەڕان / geřan/**: چاوگ. تێنەپەر. //گەڕای؛ دەگـەڕێی؛ بگەڕێ// گەڕیان: ١. هاتن و ڕۆیشتن؛ هـاتوچـۆ کردن ‹تا لای سـەعات یـازدە گـەڕام و سـووڕامەوە، وەڕەز بـووم، هاتمـەوە دوکـان «هـەژار، چێشـتی مجێور»› ٢. تەقالا دان بۆ دیتنەوەی ون ‹هـەموو کـون و قوژبنـێ گـەڕام، نەمدۆزییـەوە› ٣. لـە جـێ چوون؛ گۆڕان لە بارێکەوە بۆ بارێک ‹ئەو هەواڵە وە ڕاسـت گـەڕا؛ ڕەنگـی زەرد گـەڕابوو› ١. گـردش کردن ٢. دنبال چیزی گشتن ٣. تغییر یافتن

■ ئاوەڵنـاوی بـەرکاری: گـەڕاو/ چـاوگی نـەرێنی: نەگەڕان

**گەڕاندن / geřandin/**: چـاوگ. تێـپەر. //گەڕانـدت؛ دەگەڕێنی؛ بگەڕێنە// گەڕانن: ١. دەگەڵ خۆ بردن بۆ سووڕانەوە و پیاسە کردن و ... ‹... جەمێکمان دەگەڵ خـوارد و هـەموو ڕۆژ بـە شـارا دەیگەڕانـدین «هـەژار، چێشـتی مجێـور»› ٢. وە کـار خسـتن ‹ماشێن گەڕاندن؛ ئاش گەڕاندن› ٣. گێڕانی بان بە بانگوێر بۆ دڵۆپە نەکردن ٤. دابەش کردن ‹ئـاوی بە سەر خەڵکدا دەگەڕاند› ٥. بە سەر هێنـان ‹وی بەلاکێ ل سەر من گەڕاند› ١. به گردش بردن ٢. به کار انداختن ٣. با بام‌غلتان بام را مُحکم کـردن ۴.

تقسیم کردن ۵. برسر آوردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەگەڕاندن

**گـــەڕاندنــــەوە** / geřand(i)newe/: چـــاوگ. ۱. هاوردنەوە؛ پێدانەوە؛ دانەوە ‹بـە پەلـە قەرزەکـەی کاک ڕەحمانم گەڕاندەوە، نەوەکا تووشی زیانی زۆرتر بم! «هەژار، چێشتی مجێـور»› ۲. هەڵـگەڕاندنەوە؛ بـۆ جێــی پێشـوو هێنانــەوە ‹زۆرێ پەنابـەریان گەڕاندەوە وڵاتی خۆیان› ۳. دەس پێوە گرتن ‹ئـەو پووڵی بەرانبەر بە ئەمری بارزانی وەرمدەگرت، ئێواران هێشـتا هـەتا سـەت دینـارم دەگەڕانـدەوە «هـەژار، چێشتی مجێور»› ۱و۲. بازگرداندن ۳. صرفەجویی کردن

**گەڕانن** / geřanin/: ☜ **گەڕاندن**

**گەڕانە** / geřane/: ناو. ڕەوت؛ ڕەوتانە فرایند

**گەڕانەوە**[1] / geřanewe/: چاوگ. تێنەپەڕ. //گەڕایەوە؛ دەگەڕێیەوە؛ بگەڕێوە// گەڕیانـەوە: ۱. هاتنـەوە ۲. پیر بوون ‹پیاوێکە گەڕاوەتـەوە› ۳. واز هێنـان لـە کاری نەشیاو ‹لـە چەتـەیی گەڕاوەتـەوە و دەسـتی داوەتە کار› ۱. بازگشـتن ۲. پیـر شـدن ۳. دسـت برداشتن از کار بد

■ ئاوەڵناوی بـەرکاری: گـەڕاوەوە/ چاوگی نـەرێنی: نەگەڕانەوە

**گەڕانەوە**[2]: نـاو. جۆرێ هەڵپەڕکێ نـوعی رقـص کُردی

**گەڕانی**[1] / geřanî/: ناو. جـۆرێ ڕەقـس و سـەما و دیلان نوعی رقص کُردی

**گەڕانی**[2]: سارستە. سندان و قوزەڵـقورت (جنێویکـە) کوفت و زهرمار (دشنامی است)

**گەڕاو**[1] / geřaw/: ناو. گراو؛ چاوەی ئـاوی گـەرم و سوێر چشمەی آب گرم معدنی

**گەڕاو**[2]: ئاوەڵناو. لەجێ‌چوو؛ لە بەند ترازاو از جا دررفته

**گەڕاوە** / geřawe/: ئاوەڵناو. ۱. ☜ **هەڵگـەڕاو** ۲. تایبەتمەنـدی سـرکەیەک کـە بۆتـە شـەراب ۳. تـازەپیر ۱. ☜ **هەڵگـەڕاو** ۲. ویژگـی سـرکەی شراب شده ۳. نوپیر

**گەڕباز** / geřbaz/: ئاوەڵناو. پـیلانبـاز؛ تەپـڕەش؛ عایەر حُقەباز

**گەڕتێئـاڵاو** / geřtê'aław/: ئاوەڵـناو. گێچەڵـــی؛ کێشەدار مُشکلدار

**گەڕدە** / geřde/: ناو. نۆبە؛ نۆرە نوبت

**گەڕساز** / geřsaz/: ئاوەڵناو. تەڕن؛ چـازوو؛ فێڵـباز؛ دەسبڕ ناروزن

**گەڕڤێری** / geřvêrî/: ئاوەڵـناو. تێکـەڵ ـــ پێکـەڵ؛ ناتەکووز درهم برهم

**گەڕک** / geřik/: ئاوەڵناو. ۱. ☜ **گەڕکە** ۲. گـەڕاڵ؛ زۆر لە گەڕاندا، بێ مەبەست ۱. ☜ **گەڕکـە** ۲. هرزەگرد

**گەڕکە** / geřke/: ئاوەڵناو. گـدۆڵ؛ گـەڕک؛ گـەڕل؛ کز و کەنەفت لاغرمُردنی

**گەڕگە** / geřge/: ناو. دام و دەزگاری سەر بە میری ادارەی دولتی

**گـەڕ ـ گـەڕ** / geř geř/: ئاوەڵـناو. پـێچ ـــ پـێچ؛ پێچخواردوو ‹شالی گەڕ ـ گەڕ› پیچ‌خوردە

**گەڕگەڕە** / geřgeře/: نـاو. ۱. غەڕغـەڕە؛ قرقـرە ۲. کەمـــەی بێژنـــگ و دەف و .... ۱. قرقـرە ۲. چنبرەی غربال و امثال آن

**گەڕگەڕی**[1] / geřgeřî/: نـاو. ۱. کـولێرەی چکۆلـەی بە شیر و شەکر کـە دەسـفرۆش دەیفرۆشـن ۲. کەچەڵــێ کـە کـرێژی سـەری دیـارە ۱. نـان شیرینی کە دستفروشان می‌فروشند ۲. کچل

**گەڕگەڕی**[2]: ئاوەڵـناو. کەچەڵێ کـە کـرێژی سـەری دیارە کچلِ گَر

**گـەڕل** / geřil/: ئاوەڵـــناو. ۱. ☜ **گەڕکـــە** ۲. ☜ **گرۆێ**[2]

**گەڕمە** / geřme/: ☜ **گەمرە ـ۱**

**گەڕناس** / geřnas/: ئاوەڵناو. گرناس؛ گەرنووس؛ بوێر؛ ئازا لە شەڕ ‹زوو باوەڕی کرد بە گفتی بەدفەڕ/ گەڕناسیی لە بیر چوو، کەوتە سەر گەڕ! «هەژار، مەموزین»› ☰ شُجاع

**گەڕناسی** / geřnasî/: ناو. ئازایەتی؛ بوێری ☰ شُجاعت

**گەڕناڵ** / geřnał/: ناو. زەنگولەی زل ☰ ناقوس

**گەڕندە** / geřinde/: ئاوەڵناو. ١. گەڕا؛ گەڕۆک؛ گەڕیانۆخ؛ بڕۆک؛ بێوچان لە گەڕان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر ٢. تایبەتمەندی شتێ کە زۆر خول دەخوا ☰ ١. سیّار ٢. چرخان

**گەڕنگە** / geřinge/: ☜ **گەرانگە**

**گەڕنووس** / geřnûs/: ☜ **گەڕناس**

**گەڕوگوڕ** / geř û guř/: ناو. فێڵ و تەڵەکە ☰ حیله و نیرنگ

**گەڕوگێچەڵ** / geř û gêçeł/: ناو. گرگێچەڵ؛ گڕوگێچەڵ؛ پەلپ و تەشقەلە ☰ شلتاق و نارو

**گەڕۆک**[١] / geřok/: ناو. ١. ماشین؛ سەیارە؛ ترۆمبێل ٢. گۆی ئاسمانی ☰ ١. اتومبیل ٢. سیّاره

**گەڕۆک**[٢]: ئاوەڵناو. ١. گەڕۆڵ؛ زۆر لە ڕۆیشتندا؛ دایم بە ڕێوە ‹سەعدی ئەییامی خۆی نەبوو نانی/ وەکوو من بوو گەڕۆک و بێ خانی «حاجی قادر»› ٢. کۆچەر؛ خێڵەکی ☰ ١. سیّار ٢. کوچنشین

**گەڕۆڵ** / geřoł/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **گرویّ**[٢] ٢. ☜ **گەڕۆک**[٢]ـ١

**گەڕۆڵی** / geřołî/: ☜ **گەڕی**

**گەڕە** / geře/: ناو. ١. کاری خەرمان کوتان بە گا و گۆل ٢. شکات؛ شکایەت ☰ ١. خرمنکوبی با گاو ٢. شکایت

**گەڕەپێچ** / geřepêç/: ☜ **گێژەڵووکە**

**گەڕەپێچە** / geřepêçe/: ☜ **گێژەڵووکە**

**گەڕەک** / geřek/: ناو. ١. تاخ؛ مەحەلە ٢. زەلکاو؛ زۆنگ ٣. گێژاو؛ گێجاو ٤. مەزراق؛ مەزریج ☰ ١. محله ٢. باتلاق ٣. گرداب ۴. گردنا

**گەڕەکوێر** / geřek(i)wêr/: ئاوەڵناو. شەوکوێر ☰ شب‌کور

**گەڕەکوێری** / geřek(i)wêrî/: ناو. شەوکوێری؛ شەڤکۆری ☰ شبکوری

**گەڕەلاژە** / geřelaje/: ☜ **گەڕەلاوژە**

**گەڕەلاوژە** / geřelawje/: ناو. گەڕەلاژە؛ گەڕەلاوژێ؛ گەڕەلاوێژە؛ گەڕەلاوێژێ؛ گۆرانی کوتنی دانیشتوانی ناو کۆڕ، بە نۆرە ☰ آوازخوانی نوبتی اهل مجلس

**گەڕەلاوژێ** / geřelawjê/: ☜ **گەڕەلاوژە**

**گەڕەلاوێژە** / geřelawêje/: ☜ **گەڕەلاوژە**

**گەڕەلاوێژێ** / geřelawêjê/: ☜ **گەڕەلاوژە**

**گەڕەڵ** / geřeł/: ☜ **گرویّ**[٢]

**گەڕی** / geřî/: ناو. گەڕۆلی؛ گرویّ؛ گروو؛ گریهتک؛ جۆرێ نەخۆشی پێستە کە وەرینی ناوە ـ ناوەی موو، ئالۆش و برێ‌جار برینی لەگەڵدایە ☰ گَری

**گەڕیان**[١] / geřyan/: ☜ **گەڕان**

**گەڕیان**[٢]: ناو. جۆرێ هەڵپەڕکێی نەرم و لەسەرخۆ ‹ئای گەڕیان گەڕیان ئایە گەڕیانە/ ئایە بەزمەگەی قەدیم خوەمانە «گۆرانی»› ☰ نوعی رقص کُردی

**گەڕیانۆخ** / geřyanox/: ئاوەڵناو. ١. زۆر گەڕیدە ٢. شوێنگێڕ ٣. مالانگەڕ ☰ ١. سیّار ٢. پیگیر ٣. ولگرد

**گەڕیانەوە** / geřyanewe/: ☜ **گەڕانەوە**[١]

**گەڕیدە** / geřîde/: ئاوەڵناو. ١. گەڕۆک؛ لە گەڕان و سووڕدان ‹گەڕیدە لە مالی خۆیا میوانە «مەسەل»› ٢. *[کینایە]* گەوێل؛ دنیادیدە ☰ ١. سیّار ٢. جهاندیده

**گەڕیدەیی** / geřîdeyî/: ☜ **گێرایش**

**گەڕیز** / geřîz/: ناو. گۆ؛ هێزی دەست و دەم ☰ نیروی دست و دهان

**گەڕین** / geřîn/: چاوگ. تێپەڕ. //گەڕیت؛ دەگەڕی؛ بگەڕە// گەڕیان؛ پشکنین ☰ تفتیش کردن؛ گشتن ■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەگەڕین

ـ **گەڕێن** / geřên-/: پاشەوشە. ١. بگەڕێن ‹ئاشگەڕێن؛ ماڵگەڕێن› ٢. ـ پشکن؛ ـ پشکێن ☰ ١. گردانندە ٢. مُفتش

**گەڕێنەک** / geřênek/: ناو. گێژاوی گۆمی کووڕ ☰ گرداب مُهلک

**گەز**[١] / gez/: ناو. ١. گز؛ گزچار؛ گزم؛ گزیچار؛ گەزیچار؛ دار گەزۆ؛ شووتیەدار؛ جۆرێک دەوەنی جوان بە گەڵای نووکتیژ و گوڵی وردەوە کە لە ساقەتەکەی شیرەی گەز دێتە دەر ٢. ☜ گەزۆ ٣. گاز؛ قەپ ‹گەزێک لەو لێوە ئاڵە› ٤. گاز؛ یەکەی درێژایی نزیک بە یەک میتر ‹گەزێ زەوی لە مەنێ گەنم باشترە «مەسەل»› ٥. چز؛ چزوو ٦. خەز؛ پارچەیەکی ئاورێشمییە ٧. ☜ گسک ٨. شۆکەی دار و درەخت ٩. جۆرێک شیرینی لە شیلەی گەزۆ ١٠. کاری پێوان؛ ئەندازە گرتن ‹گەز و پێوانە ڕاستی دەردەخا «مەسەل»› ☰ ١. درخت گز ٢. ☜ گەزۆ ٣. گاز ٤. گَز ٥. نیش ٦. نوعی پارچەی ابریشمی ٧. ☜ گسک ٨. شتەی نباتات ٩. گَز ١٠. پیمایش

⊡ **گەز کردن:** ئەندازە گرتن؛ پێوان بە گەز ‹دوای شۆردن گەزی کە! «مەسەل»› ☰ گز کردن

**گەز کەردش:** ☜ گسک دان

**گەز گرتن:** ☜ گاز گرتن ـ١

**گەز.گەز باڵا کردن:** ١. زوو زل بوون ٢. *[کینایە]* زۆر پێخۆش بوون ‹بەم قسانە گەز ـ گەز باڵا ئەکا› ☰ ١. بە سرعت رشد کردن ٢. بسیار خوشحال شدن

**خیابان گەز کردن:** بەتاڵ و قەتاڵ بوون؛ وێڵ ـ وێڵ سووڕانەوە ☰ بیکار و علاف چرخیدن

ـ **گەز**[٢]: پاشەوشە. ١. بگەز؛ پێوەدەر ‹غەریبگەز› ٢. پێوەدراو ‹مارانگەز› ☰ ١. ـ گَز ٢. گزیدە شدە

**گەزارە** / gezare/: ناو. زمانی درێژ ☰ زبانِ دراز

⊡ **گەزارە دەرکێشان:** ☜ گەزارە لێ کێشان

**گەزارە لێ کێشان:** گەزارە دەرکێشان؛ زماندرێژی کردن ‹گەزارەی لێ کێشابووم، هەرچی خراپە پێی گوتم!› ☰ زباندرازی کردن

**گەزارەدار** / gezareder/: ئاوەڵناو. ئەستوور ☰ باضخامت

**گەزاف** / gezaf/: ناو. قسەی بێتام و ناخۆش ☰ یاوە

**گەزاندن** / gezandin/: چاوگ. دابووراندن؛ تێپەڕاندن ☰ خم شدن

**گەزبەتنە** / gezbet(i)ne/: ناو. قشقەڵە؛ قشقەڕە ☰ زاغی

**گەزتن** / geztin/: چاوگ. تێپەر. //گەزتت؛ دەگەزی؛ بگەزە// گەزین؛ گەژین؛ گەستن: ١. چز پێوە دان ٢. گاز گرتن؛ گەژ کرن؛ قەپ گرتن ☰ ١. گزیدن ٢. گاز گرفتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەگەزتن

**گەزتو** / geztû/: ☜ گەستە

**گەزجاڕ** / gezcař/: ☜ گزیجاڕ

**گەزخ** / gezx/: ناو. پارچەی لە شتێ بڕاو ☰ قطعەی بُریدە شدە از چیزی

**گەزخان** / gezxan/: چاوگ. پارچە بوون ☰ پارە شدن

**گەزخاندن** / gezxandin/: چاوگ. پارچە ـ پارچە کردن ☰ قطعە ـ قطعە کردن

**گەزخی** / gezxî/: ئاوەڵناو. پارچەکراو ☰ پارە شدە

**گەزرک** / gezrik/: ناو. ئاڵقە ☰ حلقە

**گەزفرۆش** / gezf(i)roş/: ناو. بەزاز؛ کووتاڵفرۆش؛ پارچەفرۆش ☰ بزّاز

**گەزک** / gezik/: ☜، گسک

**گەزگوڵە** / gezgule/: ☜ گەزۆ

**گەزگەزک** / gezgezik/: ☜ گەزنە ـ٣

**گەزگەزکە** / gezgezke/: ☜ گەزنە ـ٣

**گەزگەزۆک** / gezgezok/: ☜ گەزنە ـ٣

**گەزگەسك / gezgesik**/: ☜ **گەزنە-٣**

**گەزلك / gezlik**/: ناو. کێرد؛ گەرلك؛ چەقۆی دەنووکچەماوە بۆ هەڵکڵۆشان ≡ گزلیک

**گەزمازوو / gezmazû**/: ناو. بەری داری گەز ≡ ثمر درخت گز

**گەزمە / gezme**/: ناو. ١. تیر؛ تیرێ کە بە کەوان داوێژرێ ٢. کێشکچی شەوانە لە بازاڕ و کۆڵان ≡ ١. خدنگ ٢. عسس

**گەزن / gezin**/: ☜ **گەزەن**

**گەزندە / gezinde**/: ناوەڵناو. گەزننە: ١. گەزۆک؛ گەزە؛ گەزەک؛ گازگر ‹مێرووی گەزندە› ٢. *[مەجاز]* ئازاردەر و کاریگەر لە سەر ڕۆح و گیان ‹قسەی گەزندە› ٣. *[کینایە]* تووش؛ مافەتە ٤. تیژ؛ زمانسووتێن ٥. تفت؛ گیر ≡ ١و٢. گزنده ٣. موذی ٤. تُندمزه ٥. گس‌مزه

**گەزنک / geznik**/: ناو. ١. گیا گەسک ٢. ☜ **گەزنە-٣** ≡ ١. گیاه جارو ٢. ☜ **گەزنە-٣**

**گەزنگاز / gezingaz**/: ناوەڵناو. عەلیل؛ سەقەت؛ سەکەت ≡ علیل

**گەزننە / gezinne**/: ☜ **گەزندە**

**گەزنە / gezne**/: ناو. ١. سووریژە؛ سووریچە ٢. خەڵوەتی؛ دیوی ئازووقە ٣. گزگزە؛ گەزگەزک؛ گەزگەزکە؛ گەزگەزۆک؛ گەزگەسک؛ گەسگەسک؛ گەزنک؛ گەزۆک؛ گەزینک؛ گیاگەزۆک؛ گەزنێ؛ گەزەنێ؛ ئاڵۆشە؛ گیایەکی ئالیکی بە گەڵا و لاسکی کورکنەوە، لە پێست کەوێ دەیچووزێنێتەوە ٤. بیرۆی تەڕ ≡ ١. سُرخک ٢. پستو ٣. گزنه ٤. اگزما

**گەزنەک / geznek**/: ناوەڵناو. گزنەک؛ تووشیاری بیرۆی تەڕ ≡ مبتلا به اگزما

**گەزنەیی / gezneyî**/: ناو. جۆرێ ترێی سپی تفت ≡ نوعی انگور گَس

**گەزولە / gezule**/: ☜ **گەزۆ**

**گەزوە / gezwe**/: ☜ **گەزۆ**

**گەزۆ / gezo**/: ناو. گەز؛ گەزگولە؛ گەزولە؛ گەزوە؛ گەزوو؛ شیرینە؛ شۆکە؛ شۆک؛ شیلەی داری گەز بە ڕەنگی سپی ئاماڵ زەرد و تامی تۆزێ تاڵ کە جۆرێ شیرینی لێ دروست دەکرێ ‹دلخوەشیم هەر تۆی، لە دنیا و دینی/ بۆ من تۆ گەزۆ و شۆکە و هەنگوینی «فولکلۆر»› ≡ گزانگبین

**گەزۆبرێشکە / gezob(i)rêşke**/: ناو. گەنمی برژاوی دەگەڵ گەزۆ تێکەڵکراوی خرهەڵدراو ≡ گندم بوداده و مخلوط شده با گز

**گەزۆک / gezok**/: ناو. ١. ☜ **گەزنە-٣** ٢. ☜ **گەزندە-١**

**گەزۆکە / gezoke**/: ناو. کاکنج؛ کاکنەج ≡ کاکنج

**گەزۆکی / gezokî**/: ناو. ١. دۆکەی پەڵکی بێستان ٢. نەخۆشییەکی پێستە ≡ ١. شتەی پالیزی ٢. از بیماری‌های پوست

**گەزوو / gezû**/: ☜ **گەزۆ**

**گەزووز / gezûz**/: ناو. ١. زەمبەلیلک؛ چلوورە؛ شیشەسەهۆڵ ٢. مۆرانە؛ مەریکانە ≡ ١. دنگالە ٢. موریانە

**گەزە / geze**/: ناو. ١. ☜ **گەزندە-١** ٢. شفرەی چەرم برین ≡ ١. ☜ **گەزندە-١** ٢. شفرەی چرم بُریدن

**گەزەر / gezer**/: ناو. ١. گیایەکە لاسکی دەمژن، شیرینە ٢. ☜ **گێزەر-١** ≡ ١. گیاهی با ساقەی شیرین ٢. ☜ **گێزەر-١**

**گەزەک[1] / gezek**/: ناو. پەڵپ؛ بەهانە؛ بیانوو ≡ بهانە

**گەزەک[2]**: ناوەڵناو. ١. بەڵەد؛ شارەزای ڕێگە ٢. تیژ؛ زمانسووتێن ٣. تفت؛ گیر ٤. ☜ **گەزندە-١** ≡ ١. بلد؛ راهنما ٢. تند مزە ٣. گس مزە ٤. ☜ **گەزندە-١**

**گەزەن / gezen**/: ناو. گەزن: ١. زیان؛ زەرەر ‹...

کـە هەڵـنەگریّ/ دەسـت لـە گـەزەن هـەتا ئـەمریّ «گۆران»› ۲. بەڵا؛ بەسەرهاتی خـراپ ▪ ۱. زیـان ۲. گزند

**گەزەند** / gezend/: ئاوەڵناو. چزلێدەر؛ پێوەدەر ▪ گزنده

**گەزەنـە** / gezene/: نـاو. گیایەکـە بـە شـێکی دەخورێ ▪ گیاهی خوراکی

**گەزەنەک** / gezenek/: ناو. گزنەک؛ بیرۆی تـەڕ ▪ اگزما

**گەزەنێ** / gezenê/: ☜ گەزنە ـ۳

**گەزی**[1] / gezî/: ناو. قوماش ▪ پارچە

**گەزی**[2]: ئاوەڵکار. بە گەز؛ بە پێی گـەز ‹پارچـەکانت گەزی دەفرۆشی یان بە قەوارەیە؟› ▪ گزی

**ـ گەزی**[3]: پاشەوشە. بە ئەندازەی گەز ‹ڕیش‌گـەزی› ▪ ـگَزی

**گەزیت** / gezît/: ناو. جزیە؛ سەرانە لە ناموسوڵمانان ▪ جزیە

**گەزیچار** / gezîçar/: ☜ گەز[1]ـ۱

**گەزیزە** / gezîze/: ناو. گوڵەگەزیزە؛ بلازیز ▪ گلـی کە اوّل بهار می‌شکفد

**گەزین** / gezîn/: ☜ گەزتن

**گەزینک** / gezînik/: ☜ گەزنە ـ۳

**گەژ** / gej/: ☜ گاز[1]ـ۱

⊡ **گەژ کرن**: ☜ گاز گرتن ـ۱

**گەژار** / gejar/: ☜ گژار

**گەژاژ** / gejaj/: ☜ گژار

**گەژگەڕینک** / gejgeřînik/: ☜ گێژەڵووکە

**گەژم** / gejm/: نـاو. داری بووز؛ دار تۆفانە ▪ درخت پشە

**گەژمرانـدن** / gejm(i)randin/: چـاوگ. گـەژمرین؛ هاڕین؛ زۆر ورد کردن ▪ آسیاب کردن

**گەژمری** / gejm(i)rî/: ئاوەڵناو. هاڕدراو؛ هاڕیاگ ▪ آسیاب‌شده

**گەژمرین** / gejm(i)rîn/: ☜ گەژمراندن

**گەژوو** / gejû/: ناو. بێزوو ▪ ویار

**گەژین** / gejîn/: ☜ گەزتن

**گەژێونای** / gejêwnay/: ☜ گەشاندنەوە

**گەژێویای** / gejêwyay/: ☜ گەشانەوە

**گەست** / gest/: ئاوەڵناو. ناشیرین؛ ناحـەز؛ دزێـو ▪ زشت؛ بدگل

**گەستن** / gestin/: ☜ گەزتن

**گەستە**[1] / geste/: ئاوەڵـناو. گـەزتوو؛ چزیـاگ؛ پێوەدراو ▪ گزیدە

**ـ گەستە**[2]: پاشەوشە. ـــ گـەزتوو؛ پێـوەداو ‹مارانگەستە› ▪ ـگزیدە

**گەستەی** / gestey/: ☜ گەسەی

**گەسک** / gesk/: ☜ گسك

⊡ **گەسک دان**: ☜ گسك دان

**گەسک لێدان**: ☜ گسك دان

**گەسکدەر** / geskder/: ☜ گسکدەر

**گـەسـکلێدراو** / ges(i)klêd(i)raw/: نـاو. مـاڵاو؛ پاڕوو‌کراو ▪ روبیدە

**گەسکەتووک** / gasketûk/: ناو. گیایەکـە ▪ گیـاهی است

**گەسکەچۆلەکە** / geskeçoleke/: نـاو. گیایەکـە ▪ گیاهی است

**گەسکەخانمانە** / geskexanmane/: نـاو. گیایەکـە ▪ گیاهی است

**گەسکەسپیکە** / geskes(i)pîke/: نـاو. گیایـەکی بۆنخۆشە وشکەکەی دەکەنە گەسـک ▪ گیـاهی خوشبو

**گەسکەشاری** / geskeşarî/: ناو. گیاکەسک کـە لـە ماڵاندا دەیچێنن ▪ نوعی گیاه جارو

**گەسکەشوڵە** / geskeşûle/: نـاو. گەسـکێ کـە لـە شووڵی باریکی گزیچار دروست دەکرێ ▪ جارو از ترکەی باریک درخت گز

**گەسکەمەخمەرە / geskemexmere/**: ناو. گیایەکە ⇐ گیاهی است

**گەسگەسک / gesgesik/**: ☜ گەزنە ـ٣

**گەسەی / gesey/**: چاوگ. گەستەی؛ پێوەدان ⇐ نیش زدن

**گەش / geş/**: ئاوەڵناو. ١. بلێسەدار ‹گەلاوێژی گەش› ٢. سوورهەڵگەڕاو ‹ئاسنی گەش› ٣. شەق و تورت ‹سەوزەواتی گەش› ٤. پشکووتوو؛ شکۆفاوە ‹گوڵی گەش› ٥. شارژ؛ گەشاوە ‹وا ڕەوی مژ لە بەر ئەو پیوارە/ گەش و ڕوون بوونەوە بەو دیدارە «هەژار، *بۆکوردستان*»› ٦. بێ‌گنج ‹بە ڕووی گەشەوە دواندمی› ٧. بە ڕەنگی پۆلوو ٨. سووری خوێنی ⇐ ١. فروزان ٢. مُشتعل ٣. شاداب و تُرد ٤. شکوفا ٥. شارژ ۶. گُشاده ٧. به رنگ اخگر ٨. سُرخفام

▣ **گەش بوونەوە**: ☜ گەشانەوە

**گەش کردنەوە**: ☜ گەشاندنەوە

**گەشەو بوون**: ☜ گەشانەوە

**گەشەو کردن**: ☜ گەشاندنەوە

**گەشاندنەوە / geşand(i)newe/**: چاوگ. تێپەڕ. //گەشاندتەوە؛ دەگەشێنیەوە؛ بگەشێنەوە// گەش کردنەوە؛ گەشەو کردن؛ گەژێوناى؛ گەشنایۆ: ١. کڵپەدار کردنەوەی ئاگری دامرکاو ٢. ڕەژی باوەشێن کردن بۆ بە سکڵ بوون ٣. کەیفخۆش کردن ٤. خونچە گوڵ بشکواندن ٥. شارژ کردنەوە ⇐ ١. برافروختن؛ مُشتعل کردن آتش بعد از فرونشستن ٢. باد زدن زغال برای افروختن ٣. شاد کردن ۴. شکوفاندن ۵. شارژ کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـــ/ چاوگی نەرێنی: نەگەشاندنەوە

**گەشانەوە / geşanewe/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //گەشایەوە؛ دەگەشێیەوە؛ بگەشێوە// گەش بوونەوە؛ گەشەو بوون؛ گەشیان؛ گەشیانەوە؛ گەشینەوە؛ گەژێویای؛ گەشایۆ: ١. پشکووتنی گوڵ ٢. تێراو بوون و شەق و تورت بوون ٣. سوور بوونەوەی ڕەژی و بوونە سکڵ ٤. شاد بوون ٥. شارژ بوونەوە ⇐ ١. شکفتن ٢. شاداب شدن ٣. افروخته شدن زغال ۴. شاد شدن ۵. شارژ شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: گەشاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەگەشانەوە

**گەشاوە / geşawe/**: ☜ گەش ـ٥

**گەشایۆ / geşayo/**: ☜ گەشانەوە

**گەشبین / geşbîn/**: ئاوەڵناو. خۆشبین؛ دوور لە ناهومێدی ⇐ خوشبین

**گەشت / geşt/**: ناو. ١. سەیران؛ کاری گەڕان بە کەیف ٢. گەدایی؛ کار و ڕەوتی ماڵەوماڵ کردن بۆ پارە یان شت ⇐ ١. سیاحت ٢. گدایی

**گەشتاندن / geştandin/**: چاوگ. ١. تێ‌گەیاندن؛ حاڵی کردن ٢. پێ‌گەیاندن؛ بارهێنان ⇐ ١. فهماندن ٢. بار آوردن

**گەشتن / geştin/**: ☜ گەیشتن

**گەشتنامە / geştname/**: ناو. بیرەوەری نووسراوی گەڕیدە ⇐ سیاحتنامه

**گەشتوگوزار / geşt û guzar/**: ☜ گەشتیاری

**گەشتوگێڵ / geşt û gêł/**: ناو. گێڵوگەشت؛ گەڕ و خول؛ گەڕان و چەرخان (زۆرتر بە مەبەستی سەیران) ‹گەشتوگێل لە گەلێ ناوچەی کوردستانی ئێران و عیراقدا ... «زەبیحی»› ⇐ گشت‌وگذار؛ گردش

**گەشتۆک / geştok/**: ☜ گەشتیار

**گەشتووڵ / geştûł/**: ☜ گەشتیار

**گەشتی[١] / geştî/**: ناو. دارۆغەی ناوشار ⇐ پلیس شهری

**گەشتی[٢]**: ☜ گەیشتوو

**گەشتیار / geştyar/**: ناو. گەشتۆک؛ گەشتووڵ؛ ڕاتۆڵ؛ گەڕیدە؛ دنیاگەڕ؛ تووریست؛ ئەوەی بۆ گەشت و سەیران سەفەر دەکا ⇐ جهانگرد؛

توریست

**گەشتیاری** / geştyarî/: ناو. گەشتوگوزار؛ تووریسم: ١. سەیران؛ سەفەری سیاحەتی ٢. کار و باری ڕاکێشان و گل دانەوە و میوانداری لە گەشتیاران ☰ ١و٢. جهانگردی؛ توریسم

**گەشک** / geşk/: ناو. گەشکە؛ پووک؛ پوکاولە؛ چەمبۆلە ☰ ام

**گەشکە** / geşke/: ناو. ١. فێ؛ خوو ٢. ڕەوتی لە سەر خۆ چوون لە خۆشیان ٣. ☜ گەشك ☰ ١. صرع ٢. فرایند از شادی بیهوش شدن ٣. ☜ گەشك

⊡ **گەشکە بون**: ١. فێ لێهاتن ٢. لە خۆشیان لە سەر خۆ چوون ☰ ١. دچار صرع شدن ٢. از شادی غش کردن

**گەشکە گرتن**: فێ لێهاتن ☰ دُچار صرع شدن

**گەشکە کردن**: زۆر خۆشحاڵ بوون ☰ بسیار خوشحال شدن

**گەشکە گرتن**: فێ لێهاتن ☰ دچار صرع شدن

**گەشکەدار** / geşkedar/: ناوەڵناو. فێدار؛ خوودار ☰ صرعی

**گەشگە** / geşge/: ناو. سەیرانگا؛ جێگەی گەشت و سەیران ☰ سیاحتگاه

**گەشنایۆ** / geşnayo/: ☜ گەشاندنەوە

**گەشە** / geşe/: ناو. ١. خۆشی و شادی ٢. تێراوی و تورتی و شەقی ٣. بزە؛ زەردەخەنە ٤. لقی تازەی ڕەز ٥. ڕەوتی بالا بڵند بوون و بە خۆدا هاتن ☰ ١. شادی ٢. شادابی ٣. لبخند ۴. جوانەی تاک ۵. رُشد

⊡ **گەشە کردن**: ١. شاد بوون ٢. بالاکردن و بە خۆدا هاتن ☰ ١. شاد شدن ٢. رُشد کردن

**گەشە گرتن**: بزە هاتنە سەر دەم؛ زەردەخەنە کردن ☰ لبخند زدن

**کەوتنە گەشە**: بە خودا هاتنەوە ‹گوڵاڵەی دەشت نێرگزی هەست وەنەوشە/ وەک پێشەنگی بەهار کەوتوونە گەشە «گۆران»› ☰ شکوفا شدن

**گەشەکردو** / geşekirdû/: ناوەڵناو. هەڵدایی ☰ شکوفان

**گەشی** / geşî/: ناو. ١. تێراوی؛ دژی ژاکاوی ٢. ڕووخۆشی ٣. دڵخۆشی ☰ ١. شادابی ٢. خوشرویی ٣. دلخوشی

**گەشیان** / geşyan/: ☜ گەشانەوە

**گەشیانەوە** / geşyanewe/: ☜ گەشانەوە

**گەشینەوە** / geşînewe/: ☜ گەشانەوە

**گەف**[١] / gef/: ناو. ١. گەف؛ گەف؛ گەف؛ کاری ترساندن بە قسە ٢. تەزوو؛ مچوڕکی لەش ٣. کاری خۆ هەڵکێشان؛ پەسنی خۆ دان ٤. کاری خوێڕییانە ٥. گەژ؛ گز؛ فێڵ و گزی ٦. گاڵتە؛ گەپ ٧. قسەی بێتام ☰ ١. تهدید ٢. چگونگی تیر کشیدن اندام ٣. لاف ۴. هرزگی ۵. حیله ۶. شوخی ۷. یاوه

⊡ **گەف خواردن**: هەڕەشە لێ کران ☰ تهدید شدن

**گەف کردن**: ناو. ١. ترساندن بە قسە ‹دەس کرا بە گەف کردن/ دەگەڵ خۆ بە سەف کردن «هەژار، پێنج *ئەنگوست*»› ٢. گاڵتە کردن ☰ ١. تهدید کردن ٢. شوخی کردن

**گەف**[٢]: دەنگەناو. گەفە؛ حەپەی سەگ ☰ پارس

**گەفاندن** / gefandin/: چاوگ. هەڕەشە کردن ☰ تهدید کردن

**گەفای** / gefay/: چاوگ. گەفین؛ حەپین ☰ پارس کردن

**گەفزان** / gefzan/: چاوگ. تلانەوە؛ تلینەوە ☰ غلتیدن

**گەفوگوڕ** / gef û guř/: ناو. گەف؛ هەڕەشەوگوڕەشە ☰ تهدید

**گەفۆک** / gefok/: ناوەڵناو. *[پلار]* چەنەبازی بێتامبێژ ☰ یاوەگو

**گەفە**[1] / gefe/: ناو. گاڵتە؛ جەفەنگ ☰ شوخی

**گەفە**[2]: ☜ گەف[2]

**گەفین** / gefîn/: چاوگ. ١. حەپین؛ وەڕین ٢. هەڕەشە کردن ☰ ١. پارس کردن ٢. تهدید کردن

**گەڤ** / gev/: ☜ گەف[1]ـ١

**گەڤا** / geva/: ☜ گەواه

**گەڤار** / gevar/: ئاوەڵناو. پیس؛ گەمار ☰ چرکین؛ کثیف

**گەڤازتن** / gevaztin/: ☜ گەوزاندن

**گەڤالە** / gevale/: ناو. گەڤەل؛ گەواڵە؛ پەڵەهەوری ڕەشی بەباران ☰ لکه ابر سیاه بارانزا

**گەڤر** / gevr/: ناو. ١. سپی ئاماڵ زەرد ٢. کەوە؛ بۆر ☰ ١. سفید مایل به زرد ٢. توسی

**گەڤرک** / gevrik/: ناو. ١. پۆڕی مێوینە؛ جووتی ئاڤدەل ٢. چێرگ؛ میشەسی ☰ ١. دُراج مادینه ٢. هوبره

**گەڤری** / gevrî/: ناو. بستوو؛ زینوو؛ ملەی چیا ☰ گردنەی کوه

**گەڤریلە** / gevrîle/: ناو. سوێسکە ☰ تیهو

**گەڤز** / gevz/: ناو. ١. گەوز؛ ئەوندەی لە دروێنەدا دێتە ناو داسەوە ٢. تلی لە سەر تەنشت ☰ ١. مقداری از درو که یک بار در داس آید ٢. غلت بر پهلو

◻ **گەڤز دان**: ☜ گەوزان

**گەڤزان** / gevzan/: ☜ گەوزان

**گەڤزاندن** / gevzandin/: ☜ گەوزاندن

**گەڤزک** / gevzik/: ناو. جێگەی گەڤزان ☰ جای غلتیدن بر پهلو

**گەڤزۆک** / gevzok/: ئاوەڵناو. گەڤزوو؛ تایبەتمەندی بنیادەم یان حەیوانێ کە زۆر تل دەدا ☰ ویژگی جانداری که بسیار غلت بزند

**گەڤزوو** / gevzû/: ☜ گەڤزۆک

**گەڤزین** / gevzîn/: ☜ گەوزان

**گەڤژاڵ** / gevjal/: ناو. بەرتفک؛ مقەنەزمە؛ چەخماخی تفەنگ ☰ چخماق تفنگ

**گەڤل** / gevl/: ناو. ١. شەوەکی؛ بوولێڵە؛ بەرەبەیانی زوو ٢. شەپۆلی زل ☰ ١. سپیدەی بامدادی ٢. موج بزرگ

**گەڤلاندن** / gevlandin/: ☜ گەوزاندن

**گەڤلین** / gevlîn/: چاوگ. ١. بەرەبەیان بوون؛ بوولێڵە پەیدا بوون ٢. شەپۆلی زل دان ٣. گەڤزین؛ گەوزین ☰ ١. سپیده دمیدن ٢. موج بزرگ زدن ٣. غلتیدن

**گەڤن** / gevin/: ☜ گەون

**گەڤوگوڕ** / gev û guř/: ناو. هەڕەشەوگوڕەشە ☰ تهدید و ارعاب

**گەڤۆزە** / gevoze/: ئاوەڵناو. موو ماشوبرنج ☰ مو جوگندمی

**گەڤۆک** / gevok/: ئاوەڵناو. هەڕەشەکەر ☰ تهدیدکننده

**گەڤە** / geve/: ئاوەڵناو. گێلۆکە؛ ژار؛ بەستەزمان ☰ هالو؛ فقیرحال

**گەڤەر** / gever/: ناو. ١. پەراوێز ٢. سووچ؛ قوژبن ☰ ١. حاشیه ٢. گوشه

**گەڤەز** / gevez/: ناو. ١. گیایەکە بەنی پێ سوور دەکەن ٢. ڕەنگی سووری گەش ☰ ١. گیاهی که نخ را بدان قرمز کنند ٢. رنگ قرمز آتشین

**گەڤەزن** / gevezin/: ☜ گەوەزن

**گەڤەزە** / geveze/: ئاوەڵناو. خۆپەسند؛ خۆبەزلزان ☰ خودبزرگبین

**گەڤەزەیی** / gevezeyî/: ناو. خۆپەسنی؛ قۆڕەدەماخی ☰ خودپسندی

**گەڤەگژ** / gevegij/: ئاوەڵناو. سەرقژن و تێکەڵاو ☰ ژولیدەموی

**گەڤەل** / gevel/: ☜ گەڤالە

**گەڤەندە** / gevende/: ئاوەڵناو. شەلاتی؛

سەرسەری؛ بێشەرم ☰ بی شرم و حیا

**گەڤێژ** / gevêj/: ناو. گـەلاوێژ؛ لاڤـێژ؛ سـیوەیل ☰ ستارەی سُهیل

**گەگر** / gegir/: ناوەڵناو. گەهگر؛ گـەیگر؛ گـەیگیر؛ تایبەتمەندی یەکسمێ کە لە ڕۆیشتن سەرپێچی دەکا و مان دەگرێ ☰ گهگیر

**گـەگـری** / geg(i)rî/: ناوەڵـناو. سـەرەخەری ☰ بهانەجویی

**گەگگ** / gegig/: ☜ **گیپە**

**گـەل**[1] / gel/: نـاو. ١. کۆمـەڵ؛ گـرۆ ٢. کـاری بەکۆمـەڵ ‹ئـەچین بـۆ گـەل؛ ئیمـرۆ گەلمانـە› ٣. کۆمەڵە بنیـادەمی هاونـەژاد و خـاوەنی زمـان و خدە و خووی تایبەت بە خۆیان ‹بـەر لـە زەمـانی سـەفەوی، گـەلێک لـە مێـژوودا بـە نـاوی ئـازەری و زمانێکی تورکی بە ناوی زمانی ئازەربایجانی نەناسراوە «هەژار، چێشتی مجێور»› ٤. گەلە ‹مێگەل› ☰ ١. گروه؛ جمع ٢. کار تعاونی ٣. ملت ۴. گله

⊡ **گەل بون**: کۆ بوونەوە ☰ اجتماع کردن

**گەل بەستن**: کـۆ بوونـەوە لـە دەوری یـەکتر ☰ جمع بستن

**گەل کردن**: کاری بەکۆمەڵ کردن ☰ کار تعـاونی کردن

▪ **گـەل**[2]: پاشەوشە. گەلە؛ کۆمەڵ ‹مێگەل؛ گاگەل› ☰ گروە؛ دستە

▪ **گەل**[3]: پاشگر. یەل: ١. نیشـانەی کـۆی نەناسـراو ‹مالگەل؛ کتێوگەل› ٢. بە دوای جێناوی جیاوە بۆ پێداگری بە کار دەڕوا ‹ئێوەگەل مەشـیا بتانزانیایـە ئێمە کێین› ☰ ١. ـ ان؛ ـ ها ٢. ـ ها

**گەلا** / gela/: ناو. ئێرەقە؛ باسکە ئاموور ☰ خیش

**گەلاج** / gelac/: ناوەڵناو. گـەلاچ: ١. شـەلاتی ٢. دەسبڕ ☰ ١. لات ٢. کُلاهبردار

**گەلاچ** / gelaç/: ☜ **گەلاج**

**گەلاحە** / gelaĥe/: نـاو. گەردنبەندی گا؛ قەڵەدەی ئەستۆی گا و چێڵ ☰ قلادەی گاو

**گەلاخان** / gelaxan/: نـاو. سەردەمی گەڵاڕێزان ☰ موسم برگریزان

**گەلازەل** / gelazel/: ناو. گەڵا و پووش و چیلکـەی ئالاش ☰ انبیره

**گەلاش** / gelaş/: ناو. ناندێن ☰ جای نان

**گەلاشـان** / gelaşan/: نـاو. گەڵیشـــە: ١. وردەی پەڕیوی لۆکە و موو لە هەلاجی و شە کردنـدا ٢. خشت و خالی ناو جۆگە کە بەری ئاو دەگرێ ☰ ١. تکەهای پراکندەی پنبە و امثال آن در هلاجـی و... ٢. خس و خاشاک داخل جوی کە جلـو جریـان آب را می‌گیرند

**گەلال** / gelal/: ناو. وردەبەردی لووسی ناوچەم ☰ ماسەی رودخانە

**گەلالوچک** / gelaluçik/: ☜ **گۆشەك**

**گەلالوچ** / gelalûç/: ناو. ئـەلنگ؛ زمانەچکۆلـە ☰ زبان کوچک

**گەلالوچک** / gelalûçik/: ☜ **گۆشەك**

**گەلالە** / gelale/: نـاو. ١. ☜ **گۆشەك** ٢. گەلاڵـە ٣. پـێشنـووس ☰ ١. ☜ **گۆشـەك** ٢. طـرح ٣. پیش‌نویس

**گەلالیشک** / gelalîşk/: ناو. سووچ و گۆشەی زار ☰ گوشەی لب‌ها

**گەلانکە** / gelanke/: ناو. جار؛ ڕا؛ چـەپل؛ کـەڕەت ☰ دفعە

**گەلاو** / gelaw/: ناو. گەللاو؛ قوماریکە بـە مـۆرەی نەرد دەکرێ ☰ نوعی بازی با مُهرەی نرد

**گەلاوێژ** / gelawêj/: نـاو. گولاوێژ: ١. کاروان‌کوژە؛ پرشـنگدارترین ئەسـتێرەی ئاسمـان لـە وێنـەی گـــەردوونی ســـەگی گـــەورەدا ٢. مـــورداد؛ قۆرەپیشان؛ مانگ گاقۆڕ؛ مانگی پێنجمـی سالـی جـەلالی؛ نێوەڕاسـت مـانگی هـاوین ٣. گیشـە گەنمی درواو ☰ ١. ستارەی شِعرای یمانی ٢. مُرداد

ماه ٣. تودەی درویدەی غله

◻ **گەلاوێژ ئەنگوتن/ هەڵاتن/ کەوتن:** دیاری دانی ئەستێرەی گەلاوێژ؛ نیوە بوونی وەرزی هاوین ◼ طلوع کردن ستارەی شِعرای یمانی

**گەلاوێژی**[١] / gelawêjî/: ناو. کاری ڕیز کردنی باقە دەخڵ بە شێوەیێ کە گوڵەکان بچنە سەر یەک ◼ عمل ردە کردن بستەهای غلەی درویدە بە ترتیبی کە خوشەها بر هم آیند

**گەلاوێژی**[٢]: ئاوەڵناو. دوای گەلاوێژ ئەنگووتن وە بەر هاتوو (بڕکە خەیار، توو و ...) ◼ بعد از طلوع ستارەی شعرا ثمر دادە (بوتەی خیار و ...)

**گەلایۆل** / gelayol/: ☜ **گوڵەدیاری**

**گەلبازە** / gelbaze/: ناو. کۆمەڵی باڵداران پێکەوە لە حەواوە ◼ دستەی پرندگان در حال پرواز

**گەلپ** / gelp/: ☜ **گوپ ـ١**

**گەلپەرست** / gelperist/: ناو. خەڵکدۆست ◼ مردمدوست

**گەلپەرستی** / gelperistî/: ناو. گەلحەزی؛ چۆنیەتی زێد و خەڵک خۆش ویستن ◼ مردمدوستی

**گەلج** / gelc/: ناو. گەلش؛ کێشە و دمبەدمە ◼ جدال

**گەلحۆ** / gelĥo/: ئاوەڵناو. *[پلار]* گەلهۆ؛ گەمحێل؛ تەژەی دەبەنگ و ناتێگەیشتوو ◼ لندهورِ

**گەلحۆیی** / gelĥoyî/: ☜ **گێژەگێژ**

**گەلحەز** / gelĥez/: ئاوەڵناو. میللەتخۆشەویست ◼ ملتدوست

**گەلخۆر** / gelxor/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* خاوەن دەسەلاتی بێبەزەیی دەگەڵ ژێردەستاندا ◼ حاکم ستمگر

**گەلدار** / geldar/: ناو. داری زل ◼ درخت بزرگ و تناور

**گەلدو** / geldû/: ناو. هەرزن؛ کۆرەک ◼ ارزن

**گەلدەس**[١] / geldes/: ناو. دەسگەل؛ کاری بە کۆمەڵ ◼ کار گروهی

**گەلدەس**[٢]: ئاوەڵناو. کۆمەڵی؛ بە کۆمەڵ ‹کاری گەلدەس› ◼ گروهی

**گەلش** / gelş/: ناو. کێشە و دمەقاڵە ◼ نزاع و کشاکش

**گەلفاندن** / gelfandin/: چاوگ. ١. کوتان ٢. هەڵوەراندن ◼ ١. کوبیدن ٢. کندن و ریختن

**گەلفچاندن** / gelf(i)çandin/: چاوگ. ١. هەڵوەراندن ٢. ورد کردن ◼ ١. کندن و ریختن ٢. خُرد کردن

**گەلفچین** / gelf(i)çîn/: چاوگ. ١. هەڵوەرین ٢. ورد بوون ٣. سیس بوون و گەچران ◼ ١. کندە شدن و ریختن ٢. خُرد شدن ٣. چروکیدن

**گەلفین** / gelfîn/: چاوگ. ١. کوتران ٢. هەڵوەرین ٣. ورد کران ◼ ١. کوبیدە شدن ٢. کندە شدن و ریختن ٣. خُرد شدن

**گەل ـ گەل** / gel gel/: ئاوەڵکار. پۆل ـ پۆل؛ کۆمەڵ ـ کۆمەڵ؛ چین بە چین: *ئـا)* بۆ مرۆ ‹قەورم بکەنن لە ڕێگەی کانی/ گەل ـ گەل نازاران جەم بنە بانی «فولکلۆر»› *ب)* بۆ گیانلەبەران ‹تۆ گەل ـ گەل کەل‌گەل وە چەم مەکەردی/ پاریز وە پای ڕێز هەستیم مەوەردی «مەولەوی»› ◼ گروە ـ گروە؛ دستە ـ دستە

**گەللات** / gellat/: ئاوەڵناو. مفتەخۆر؛ چەورەی ماڵانگەر ◼ مُفتخور

**گەللاس** / gellas/: ناو. ئاژاوە؛ پشێوی ◼ آشوب و فتنە

**گەللاو** / gellaw/: ☜ **گەلاو**

**گەللایی** / gellayî/: ئاوەڵناو. گوێنەدەر؛ بێمبالات ◼ بیمبالات

**گەلمیری** / gelmîrî/: ناو. دیمۆکراسی؛ حکوومەتی خەڵک بە سەر خەڵکدا ◼ دموکراسی؛ مردمسالاری

**گیاکەوەل** / g(i)yakewel/: ناو. گیایەکی یەکسالەی ئامال کەوە، بە گەلای پانکەلەی پچووک و بەریێ خڕی سفتەوە کە ڕەنگی کەوەی لێ دەبێتەوە و هەر لە شێف و وەرددا دەڕوێ ≡ گیاهی است

**گیاگریچک** / g(i)yag(i)rêçik/: ناو. گیایەکە دەرمانی زک وێستان و برینە ≡ گیاه هفت‌بند

**گیاگزگانە** / g(i)yagizgane/: ناو. تەپۆلەگیا ≡ گیاه طاوسی رنگ

**گیاگڤە** / g(i)yag(i)ve/: ناو. گیایەکی یەکسالەی لاسک سپی و ڕەق و گەلا وردە، بە تێکرا خڕکەلە و گیف کردووە ≡ گیاهی است

**گیاگوارە** / g(i)yag(i)ware/: ناو. گیایەکە لاسکی گولەکەی هلۆلە و مندالان گوارەی پێ دروست دەکەن ≡ گیاهی است

**گیاگولەنگ** / g(i)yaguleng/: ☜ **گیاماران**

**گیاگولینگە** / g(i)yagulinge/: ناو. گیایەکە گەلای وەک فریزوو وایە و گولی سپی دەردەکا ≡ گیاهی است

**گیاگۆپاڵ** / g(i)yagopał/: ناو. تاتۆلە؛ تاتوولە ≡ گیاه تاتوره

**گیاگۆچان** / g(i)yagoçan/: ناو. پلەوێن؛ گیاوەگۆچانە؛ سێبەرێ؛ سێپەڕ ≡ اکلیل‌الملک

**گیاگەزۆک** / g(i)yagezok/: ☜ **گەزنە-۳**

**گیاگەسک** / g(i)yagesk/: ناو. گیاگێزک؛ گیایەکی بەرزەبالایە و تۆوێکی وەک هەرزن دەگرێ ≡ گیاه جارو

**گیاگەنان** / g(i)yagenan/: ناو. جۆزەردان؛ دوایین مانگی بەهار ≡ خرداد

**گیاگەنم** / g(i)yagenim/: ☜ **گیاگەنمە**

**گیاگەنمە** / g(i)yagenme/: ناو. گیاگەنم؛ گیایەکی بەرزەبالای بە ڕەنگ و شێواز وەک گەنمە بە دانێکی خڕیلەی ڕەشەوە کە لە ناو گەنمدا دەڕوێ و دەبێ لێ هەلاواردرێ ≡ گیاهی است

**گیاگێزک** / g(i)yagêzik/: ☜ **گیاگەسك**

**گیاگێسک** / g(i)yagês(i)k/: ناو. گیایەکی گوڵ زەردی زۆر تالە ≡ گیاهی است

**گیاگێلە** / g(i)yagêle/: ☜ **گیاشلە**

**گیالاڤا** / g(i)yalava/: ☜ **گیالاوە**

**گیالاوە** / g(i)yalawe/: ناو. گیالاڤا؛ بەڕەزا ≡ گیاهی است

**گیامار** / g(i)yamar/: ناو. گیایەکە دەرمانی مارانگەستە ≡ گیاهی پادزهر نیش مار

**گیاماران** / g(i)yamaran/: ناو. گیاگولەنگ؛ ترچک؛ کەبەر؛ مارچێوە ≡ مارچوبه

**گیامرۆژە** / g(i)ymiroje/: ☜ **کەتان[۲]-۱**

**گیامسک** / g(i)yamisk/: ناو. گیایەکی زۆر بۆنخۆشە ≡ گیاهی خوشبو

**گیاموینە** / g(i)yamûyne/: ناو. گیایەکی گەلا پان و تووکنە، مالات نایخوا ≡ گیاهی است

**گیامەترەق** / g(i)yametreq/: ناو. پووە؛ کەڕەپوو؛ گیای قامیشی کەڕەگۆشە ≡ لوئی

**گیامەلا** / g(i)yamela/: ناو. گیایەکی گەلا پانە وەک گوێبەرخۆلە وایە بۆ دۆکلیو دەبێ ≡ گیاهی آشی

**گیامێرول** / g(i)ymêrûl/: ☜ **کەتان[۲]-۱**

**گیامێش** / g(i)yamêş/: ناو. ۱. بێژان ۲. گولی داودی ≡ ۱. گیاهی صحرایی ۲. گل داوودی

**گیامێشولە** / g(i)yamêşûle/: ناو. گیایەکە وەک سێسوو بۆ باقەبێن دەبێ ≡ گیاهی کە برای بستەبندی علوفە بە کار می‌رود

**گیان[۱]** / g(i)yan/: ناو. ۱. گیون؛ جان؛ هێزی هەناسەدان و جوولانی زیندوو ‹گیانی دەرچوو› ۲. *[مەجاز]* بەدەن؛ لەش ‹هەموو گیانم ژان دەکا› ≡ ۱. جان ۲. تن

▣ **بە گیان و دڵ**: *[مەجاز]* پڕ بە دڵ ≡ از دل و جان

◘ **گیان ئەسپاردن:** ☜ **گیان دان**

**گیان بوونە مل:** ☜ **لە گیانی خۆ یاس بون**

**گیان بەخت کردن:** گیان فیدا کردن؛ گیان دانان ‹بۆت بەخت دەکەم گیانی شیرینم› ☰ جان فدا کردن

**گیان بە دەستەوە دان:** ۱. ☜ **گیان دان** ۲. *[کنایە]* سازان و گونجان ☰ ۱. ☜ **گیان دان** ۲. سازش کردن

**گیان بە شتێک(ەوە) بون:** *[مەجاز]* بۆ جێبەجێ بوونی کارێک یان نەقەومانی کارەساتێک، هەبوونی شتێک زۆر گرینگ بوون ‹گیانم بەم گۆپالە بوو سەگ نەیانخواردم!› ☰ برای انجام کاری، وجود چیزی بسیار اهمیت داشتن

**گیان پێدانەوە:** *[مەجاز]* بووژاندنەوە؛ زیندوو کردنەوە ☰ جان دوباره بخشیدن

**گیان تێدا بون:** زیندوو بوون ☰ جان داشتن

**گیان تێ کەوتنەوە/ هاتنەوە:** گیان گرتنەوە: ۱. زیندوو بوونەوە ۲. *[کنایە]* بووژانەوە ‹وچانێکم دا، گیانم تێ کەوتەوە!› ☰ ۱. زنده شدن ۲. جان تازه گرفتن

**گیان دان:** گیان ئەسپاردن؛ گیان بە دەستەوە دان؛ گیان سپاردن: ۱. گیان دەرچوون ۲. لە حاڵی گیانەڵادا بوون؛ کەوتنە حاڵی مەرگەوە ‹دوکتور ئەو کابرایە خەریکە گیان ئەدا، بگە فریای!› ☰ ۱. جان سپردن ۲. در حال مرگ بودن

**گیان سپاردن:** ☜ **گیان دان**

**گیان فیدا کردن:** ☜ **گیان بەخت کردن**

**گیان کردنە گیان شتێ/ کەسێکەوە:** *[مەجاز]* بۆ کەسێ خزمەت و کردوکۆشی زۆر کردن (ئەم نیوڕستەیە هەمیشە بە نیوڕستەیەک تەواو دەبێ کە بێ‌کەڵک بوونی کارەکە نیشان دەدا) ‹ گیان بکەیە گیانیەوە دروست نابێ› ☰ هر کاری کردن

**گیان کەندن:** گیان کەنن: ۱. کوشتن ۲. گیان دەرچوون ☰ ۱. میراندن ۲. مُردن

**گیان کەنن:** ☜ **گیان کەندن**

**گیان کێشان:** مراندن؛ گیان سەندن ‹با قافیز بێ گیانم بکێشێ› ☰ جان گرفتن

**گیان گرتنەوە:** ☜ **گیان تێ کەوتنەوە/ هاتنەوە**

**گیان لە سەر دەست نان:** *[مەجاز]* گیان بەخت کردن؛ بەرهەڤی گۆڕی بوون ☰ جان بر کف نهادن

**گیانی کەسێک سەندنەوە:** *[مەجاز]* کەسێک لە مردن ڕزگار کردن ☰ جان کسی را خریدن

**داوای گیان کردن:** *[مەجاز]* زۆر خۆشەویست بوون و هەرچێک ویستن بۆی بەجێ هێنان ‹تۆ داوای گیان بکە!› ☰ جان خواستن

**کەوتنە گیانی کەسێک/ شتێک:** *[مەجاز]* سەر تێ کردن و تێک دان ☰ بە جان کسی/ چیزی افتادن

**گەیشتنە گیان:** *[مەجاز]* تەواو بێزار بوون و تاقەت نەمان ☰ به جان آمدن

**لە گیانی خۆ یاس بون:** گیان بوونە مل؛ لە ژیانی خۆ وەڕەز بوون ☰ از جان خود سیر شدن

**گیان**[۲]: سارستە. ۱. بەڵێ لە خۆشەویستیدا ‹ـ کاکە! ـ گیان› ۲. دواندنی خۆشەویستانە ‹دا گیان! وەرە لامان!› ۳. ئۆخەی ‹گیان! سەرکەوتم؛ گیان! هات› ٤. دەی؛ ئافەرەم؛ بارەکەڵا؛ وشەیەکە بۆ هاندان ‹گیان! ئەمانی مەدەن!› ٥. نیشانەی ڕێز گرتن و پێ‌زانین ‹گیان بۆ ئەو قسەتە!› ☰ ۱. جانم ۲. جان ۳ تا۵. جانمی

◘ **گیانی گیان:** ☜ **گیانی گیانان**

**گیانی گیانان:** گیانی گیان: ۱. *[کنایە]* خودا ۲. *[کنایە]* گراوی ☰ ۱. خُدا ۲. معشوق

**گیاناسی** / g(i)yanasî/: ناو. ڕوەکناسی ☰ گیاەشناسی

**گیانبازی** / g(i)yanbazî/: ناو. جانگۆڕی؛

گیان‌فیدایی 🇮🇷 جانبازی

**گیانبژوێن** / g(i)yanbijwên/: ئاوەڵناو. بووژێنەر 🇮🇷 حیات‌بخش

**گیانبەختکردوو** / g(i)yanbextkirdû/: ئاوەڵناو. گیان‌فیدا؛ گیان‌لەسەر دەست 🇮🇷 جان‌فدا

**گیانبەخش** / g(i)yanbexş/: ئاوەڵناو. گۆری؛ خۆ بە قوربان‌کەر 🇮🇷 جان‌فدا

**گیانبەخشی** / g(i)yanbexşî/: ناو. فیداکاری 🇮🇷 فداکاری

**گیانبەر**[١] / g(i)yanber/: ناو. پێمێردی خودا 🇮🇷 عزرائیل

**گیانبەر**[٢]: ئاوەڵناو. *[کینایە]* ئازا لە جەنگ 🇮🇷 شُجاع

**گیانپارێز** / g(i)yanparêz/: ☜ **گیان‌خۆشەویست**

**گیانخۆشەویست** / g(i)yanxoşewîst/: ئاوەڵناو. گیان‌پارێز: ١. تایبەتمەندی کەسێ کە زۆر خۆی خۆش دەوێ ٢. ترسەنۆک 🇮🇷 ١. مُحتاط از ترس جان ٢. بُزدل

**گیاندار**[١] / g(i)yandar/: ناو. ژینەوەر؛ گیانەوەر؛ گیانلەبەر؛ گیاندەبەر؛ زیندوو 🇮🇷 جاندار

**گیاندار**[٢]: ئاوەڵناو. زیندوو؛ زینگ 🇮🇷 زنده

**گیاندەبەر** / g(i)yandeber/: ☜ **گیاندار**[١]

**گیانسووز** / g(i)yansûz/: ئاوەڵناو. بەسام؛ بەهەیبەت 🇮🇷 هولناک

**گیانسەخت** / g(i)yansext/: ئاوەڵناو. ١. *[کینایە]* سەرسەخت؛ نەسازاو لە مامەڵەدا ٢. تایبەتمەندی زیندوێ کە لە گیان دەرچووندا درەنگ دەکا 🇮🇷 ١. سرسخت در معامله ٢. جان سخت

**گیانفیدا** / g(i)yanfida/: ئاوەڵناو. گیان‌فیدا؛ گیان‌لەمست؛ جان‌گۆری؛ ئامادە بۆ مەرگ 🇮🇷 فدایی

**گیانفیدایی** / g(i)yanfîdayî/: ناو. جانگۆری؛ گیانبازی 🇮🇷 جانبازی

**گیانکەنشت** / g(i)yankenişt/: ناو. دەمی گیان دەرچوون 🇮🇷 هنگام نزع

⊡ **گیانکەنشت کردن**: خەریک گیان دان 🇮🇷 در حال جان دادن

**گیانکەنکە** / g(i)yankenke/: ناو. ئیزرایل؛ پێمێرد؛ فرشتەی گیان کێشان 🇮🇷 عزرائیل

**گیانکی** / g(i)yankî/: ناو. کاری شێخ و مەلا 🇮🇷 روحانیت

**گیانکێش** / g(i)yankêş/: ناو. پێمێرد 🇮🇷 عزرائیل

**گیانگیانی** / g(i)yang(i)yanî/: ☜ **گیانی**

**گیانلەبەر** / g(i)yanleber/: ☜ **گیاندار**[١]

**گیانلەسینگ** / g(i)yanlesîng/: ئاوەڵناو. ١. گیان‌سەخت ٢. *[کینایە]* خوێڕی و کەم‌غیرەت 🇮🇷 ١. جان‌سخت ٢. ترسو

**گیانلەمست** / g(i)yanlemist/: ☜ **گیان‌فیدا**

**گیانودڵ** / g(i)yan û dił/: ناو. دڵ‌وگیان؛ زێڵ‌وولک؛ ژیان و بەندی دڵ 🇮🇷 جان‌ودل

**گیانوڕۆح** / g(i)yan û řoĥ/: ناو. *[کینایە]* شت یا کەسی یەکجار خۆشەویست 🇮🇷 عزیزِ دل

**گیانوزینە** / g(i)yanuzîne/: ناو. بارپزە؛ گیایەکی ئالفی گەلا کەسکە؛ بە پرزە و گوڵی زەردی زۆرەوە بۆ دەرمان دەشێ 🇮🇷 بارزد

**گیانە** / g(i)yane/: سارستە. ئەی خۆشەویستم 🇮🇷 جانا

**گیانەسەر** / g(i)yaneser/: ئاوەڵناو. زۆر وەڕەز 🇮🇷 به‌جان آمده

⊡ **گیانەسەر کردن**: زۆر وەڕەز کردن هەروەها: **گیانەسەر بوون** 🇮🇷 جان به لب کردن

**گیانەگوینە** / g(i)yanegûyne/: ناو. *[پلار]* دوامین پشوو 🇮🇷 آخرین رمق

**گیانەلا** / g(i)yaneła/: ناو. گیانەلاو؛ دەمی ئاویلکەدان؛ دەمەدەمی گیان دەرچوون 🇮🇷 حالت نزع

**گیانەلاو** / g(i)yaneław/: ☜ **گیانەلا**

**گیانەڵگیان** / g(i)yanełg(i)yan/: ☜ **گیانی**

**گیانەمەژگ** / g(i)yanemejg/: ناو. مـۆخ؛ مێشـکێ کە لـە نـاو ئێسـکی ئەنـدامانی لەشـدایە ☰ مغز استخوان

**گیانەوەر** / g(i)yanewer/: ناو. ژینەوەر؛ زیندەوەر؛ جانەوەر ☰ جانور

**گیـانی** / g(i)yanî/: ئاوەڵـناو. گیـان گیـانی؛ گیانەڵگیان؛ گیانی ـ گیـانی؛ زۆر خۆشەویسـت ☰ جانی؛ بسیار عزیز

**گیـانی ـ گیـانی** / g(i)yanî g(i)yanî/: ئاوەڵـناو. گیانی؛ یەکجار خۆشەویست ☰ جانجانی

**گیانێ** / g(i)yanê/: سارستە. گیانە؛ وشەی دواندنی زۆر خۆشەویست ☰ جانا

**گیـاوردەڵـە** / g(i)yawirdełe/: نـاو. گیایـەکی پچووکی گەڵا پانە لە سەرەتای بـەهاردا دەڕوێ و دەخورێ ☰ گیاهی دارویی

**گیاوەردێنە** / g(i)yawerdêne/: نـاو. گیایەکـە بـۆ دەرمانی چاوێشە دەبێ ☰ گیاهی داروی چشم درد

**گیـاوەسمە** / g(i)yawesme/: نـاو. خومەهـەردە؛ گیایەکە خومی لێ چێ دەکەن ☰ وسمە

**گیاوەگۆچانە** / g(i)yawegoçane/: ☜ **گیاگۆچان**

**گیاهـوینک** / g(i)yahûynik/: نـاو. گیایەکـە بـۆ دەرمان دەشێ ☰ گیاهی دارویی

**گیاهەرزە** / g(i)yaherze/: ناو. بژار؛ بـژاڵ ☰ علف هرز

**گیاهەوێدار** / g(i)yahewêdar/: ئاوەڵناو. گیایـەکی گەڵا پانە لە نساری کێوان دەڕوێ، لە سەر برینی جێ دەمی ماری دەنـێن ژارەکـەی دەکێشـێ ☰ گیاهی دارویی

**گیایکەر** / g(i)yayker/: ناو. سوالکەر؛ دەرۆزەکـەر ☰ گدا

**گیایی** / g(i)yayî/: ئاوەڵناو. ١. بـە ڕەنگـی گیـا ٢. سەر بە گیا ٣. گیاژی؛ گیاخۆر ☰ ١. به رنگ گیـاه ٢. گیاهی ٣. گیاهخوار

**گیپ** / gîp/: ☜ **گوپ ـ١**

**گیپا** / gîpa/: ☜ **گیپە**

**گیپاڵ** / gîpał/: ناو. عوور؛ زگی سەر ڕیخۆڵەدان ☰ شکم بالای شکمبه

**گیپش** / gîpiş/: ناو. گوپ؛ گووپ ☰ لُپ؛ گونه

**گیپلدەرە** / gîpildere/: ☜ **گوخلێتکە**

**گیپن** / gîpin/: ئاوەڵناو. گیپنە: ١. گـوپن؛ گـووپن؛ گوپ‌زل ٢. کورتەباڵای قەڵەو ☰ ١. لُپ برآمـده ٢. کوتاه‌قد چاق

**گیپنە** / gîpne/: ☜ **گیپن**

**گیپە** / gîpe/: ناو. گیپا؛ گەگڤ؛ کیپـار ☰ سـیرابی آکنده از قیمه و برنج

**گیت** / gît/: ناو. تۆف؛ با و بۆران ☰ دمه و طوفان

**گیتـار** / gîtar/: نـاو. سـازی ژێـداری پشـت و ڕوو تەخت بە دەسکێکەوە کە قورمیشـی کـۆکی لـە سەرە و شەش تەلی پێوەیە، بە قامک یان پێژەن دەژەنرێت ☰ گیتار

**گیتاڵ** / gîtał/: ناو. تیتـۆڵ؛ بزگـوڕ ☰ کهنـه‌پارەی فرسوده

**گیتر**[1] / gîtir/: نـاو. گیتـک: ١. لەتـەر؛ بەلـەک ٢. ئێسکی بەلەک ☰ ١. ساق ٢. استخوان ساق

**گیتر**[2]: ئاوەڵناو. گیتک؛ شـەل بـە هـەر دوو لادا ☰ لنگ از هر دو پا

**گیتک** / gîtik/: ☜ **گیتر**

**گیتە** / gîte/: نـاو. ئاڵـوودار؛ دارێ کـە بـە سـەر کاریتەدا ڕادەکێشرێ ☰ الوارهای سقف

**گیتەڵە** / gîteļe/: ناو. تەشقەڵە؛ گـەڕ؛ گێچـەڵ ☰ شلتاق

**گیج**[1] / gîc/: ☜ **گەچ**

**گیج**[2]: ☜ **گێژ**[2]

**گیچ** / gîç/: ☜ **گوێز**

**گیدۆ** / gîdo/: ☜ **گێژەڵوکە**

**گیر**[1] / gîr/: ناو. ١. بەرھەڵست؛ بەربەست ٢. پەتی حەیوان بەستنەوە ٣. بەند؛ گرفت ‹کەوتنە گیر› ☰ ١. مانع ٢. رسن بستن دام ٣. بند

⊡ **گیر بوون:** وێستان؛ مانەوە ‹لە ھیچ شوێنێ گیر مەبە! برۆ!› ☰ بند شدن

**گیر خستن:** ١. گرتن ٢. دەست خستن ☰ ١. گیر انداختن ٢. گیر آوردن

**گیر خواردن:** گرفتار بوون ☰ گرفتار شدن

**گیر (پێ) دان:** ڕاگرتن؛ بەر بە ڕۆیشتن گرتن ☰ مانع از رفتن شدن

**گیر کردن:** ١. کەوتنە گیر؛ مانەوە لە ڕۆین ٢. شتێ بە شتێکەوە قایم کردن ‹دەستی لێ گیر کرد› ☰ ١. گیر کردن ٢. چیزی را محکم به چیز دیگر بستن

**گیر کەوتن:** ١. گرفتار بوون ٢. دەس کەوتن ☰ ١. گرفتار شدن ٢. گیر آمدن

**گیر ھاتن:** پەیا بوون؛ دەس کەوتن ☰ گیر آمدن

**کەوتنە گیر:** کەوتنە داوەوە ‹گورگی پیر ناکەوێتە گیر «مەسەل»› ☰ به دام/ بند افتادن

**گیر**[2]: ئاوەڵناو. ١. تایبەتمەندی خۆراکێ کە بە سانایی قووت نادرێ ٢. ڕژد؛ چکووس ٣. بەستراو؛ بەسیاگ ☰ ١. گلوگیر ٢. خسیس ٣. مسدود

**ـ گیر**[3]: پاشەوشە. ـگر؛ بگر ‹ڕووگیر؛ دەسگیر؛ دلگیر› ☰ ـگیر

**گیرا** / gîra/: ئاوەڵناو. ١. ڕاکێشەر ‹دەنگێکی گیرای ھەیە› ٢. وەرگیراو ‹دۆعای گیرایە› ☰ ١. جذاب ٢. مُستجاب

⊡ **گیرا بوون:** وەرگیران؛ بەجێ ھاتن ☰ مُستجاب شدن

**گیراز** / gîraz/: ☜ **گێراز**

**گیرام** / gîram/: ☜ **گریمان**

**گیران** / gîran/: چاوگ. تێنەپەڕ. //گیرای؛ دەگیرێی؛ بگیرێ// گران؛ گیریان: ١. گرفتار بوون؛ دەگیر کەوتن ٢. گریان؛ فرمێسک داخستن ٣. کپ بوون ‹لوولەی ئاوەکە گیراوە› ٤. بەستران ‹ڕێگای ورمێ گیراوە› ٥. دەستگیر کران ‹دزەکان گیران› ٦. ڕەش داگەڕانی مانگ و ڕۆژ ‹ئەو ساڵە خۆر گیرا› ٧. قەبز بوون؛ تێکچوونی باری ئاسایی ھەزم و دانانی خوراو ‹کەم بخۆ دەگیرێی› ☰ ١. گرفتار شدن ٢. گریستن ٣. کیپ شدن ۴. مسدود شدن ۵. دستگیر شدن ۶. خسوف یا کسوف روی دادن ٧. دچار امتلاء شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: گیراو/ چاوگی نەرێنی: نەگیران

**گیراندن** / gîrandin/: چاوگ. ١. بەستن؛ کپ کردن ٢. ☜ **گریاندن** ☰ ١. مسدود کردن ٢. ☜ **گریاندن**

**گیراو**[1] / gîraw/: ئاوەڵناو. گیریاو؛ گراو؛ گیریاگ: ١. گرفتار ٢. بەستراو؛ بەسیاگ ٣. ڕەش ھەڵگەڕاو ٤. تازە فێرەبار و زین‌کراو ☰ ١. گرفتار ٢. سد شده ٣. گرفته؛ تاریک شده ۴. تازه رام شده برای بار و زین

**ـ گیراو**[2]: پاشەوشە. ـ گیریاو؛ ـ گیریاگ؛ بەسراو ‹سەرگیراو؛ بەکرێ‌گیراو؛ گەرووگیراو› ☰ ـ گرفته

**گیراوردە** / gîrawirde/: ئاوەڵناو. دۆزراوە؛ دۆزیاگەوە ☰ پیداشده

**گیراوە** / gîrawe/: ناو. ١. تێکەڵ‌کراوی چەند شتێ بۆ دەرمان ٢. خاک و ئاوی بە قوڕ کراو ☰ ١. درهم آمیخته برای دوا ٢. گِل سرشته

**گیراوی** / gîrawî/: ناو. دیلی؛ بەندیەتی؛ ژێرچەپۆکی ☰ اسارت

**گیرچ** / gîrç/: ☜ **گۆیژ**

**گیرخواردوو** / gîrx(i)wardû/: ☜ **گیرکردوو**

**گیرسان** / gîrsan/: ☜ **گرسان**

**گیرسانەوە** / gîrsanewe/: چاوگ. تێنەپەڕ.

//گیرسایەوە؛ دەگیرسێیەوە؛ بگیرسێوە// بەند بوون لە شوێنێ ‹ژیانم پڕ لە ڕەنج و دەرد و داخە/ ئەوا گیرسامەوە لەو کێو و شاخە «هێمن»› ≡ بند شدن به جایی

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: گیرساوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەگیرسانەوە

**گیرستن** / gîristin/: ☜ **گریان**[1]

**گیرسک** / gîrsik/: ☜ **کرۆسك-١**

**گیرفان** / gîrfan/: ناو. گیفان؛ بەریک؛ بەرک؛ جێو ≡ جیب

⊡ **گیرفان کون/ کونا بوون:** *[کینایە]* دەسبا و هەڵەخەرج بوون ≡ ولخرج بودن

**گیرفان (بۆ) هەڵدروان:** *[کینایە]* بە تەمای شتێک بوون ≡ کیسه دوختن

**گیرفان یەکێ بوون:** *[کینایە]* پێکەوە زۆر دۆست بوون و جیاوازییەک لە نێواندا نەمان ≡ من و تو نداشتن

**دەست بە گیرفانی خاڵیدا نەکردن:** *[کینایە]* تووشی هەژاری و دەستەنگی نەبوون ‹یاخوا هەرگیز دەست بە گیرفانی خاڵیدا نەکەی!› ≡ نیازمند نشدن

**دەستی کەسێک لە گیرفانی خۆدا بوون:** *[کینایە]* لە بواری خەرج و بەرجەوە سەربەخۆ بوون ≡ دست در جیب خود داشتن

**سپێ لە گیرفانی کەسێکدا چۆپی کێشان:** *[مەجاز]* سپێ لە گیرفان کەسێ فەتاح پاشایی کردن؛ تەواو بێ ماڵ و حاڵ بوون ≡ به غایت بی‌پول و دست خالی بودن

**سپێ لە گیرفان کەسێ فەتاح پاشایی کردن:** ☜ **سپێ لە گیرفانی کەسێکدا چۆپی کێشان**

**گیرفانبڕ** / gîrfanbiř/: ناو. *[کینایە]* کیسەبڕ؛ کەسێ کە دەست بە گیرفانی خەڵکدا دەکا و شتیان لێ دەدزێ ‹کە تۆ گیرفانپڕی، گیرفانبڕی! من هەر هەژار ماوم/ کە تۆ خۆت دا بە خواردن، من دەگەڵ گاڵ و بەڕوو کوردم «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ≡ جیب‌بر

**گیرفانپڕ** / gîrfanpiř/: ناو. *[کینایە]* دارا؛ دەوڵەمەن ≡ ثروتمند

**گیرکردوو** / gîrkirdû/: ئاوەڵناو. گیرخواردوو؛ قەتیس؛ قەتیز؛ بێدەرەتان ≡ گرفتار

**گیرکە** / gîrke/: ناو. دڕۆک؛ کەڵپ؛ کەڵوە ≡ ناب درنده

**گیرگە** / gîrge/: ناو. ١. ددانی پێشین ‹ پیر بووە گیرگەی نەماوە!› ٢. جێگەیێ کە شتی لێ گیر بێت ٣. ئامرازی خوار کردنەوەی دار بۆ گۆچان و کەمە ≡ ١. ناب؛ دندان پیشین ٢. جای گیر کردن چیزی ٣. ابزار خم کردن چوب

**گیرنای** / gîrnay/: چاوگ. بوونە هۆی گیران ≡ گرفتن

**گیرنەدەر** / gîrneder/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* قنگ‌فش؛ بالێبووەوە ≡ گوزو

**گیرودار** / gîr û dar/: ناو. بگرە و بەردە ≡ گیرودار

**گیروگرفت** / gîr û g(i)rift/: ناو. گیرودار؛ گیرە و کێشە ≡ گیروگرفت

**گیرۆ** / gîro/: ئاوەڵناو. ئاهۆ؛ بە تایبەتمەندی گۆزانەوە لە کەسێکەوە بۆ کەسێ‌تر و کارتێکردنی ‹گریان و پێکەنینیش وەک برێ نەخۆشی گیرۆن› ≡ واگیردار

**گیرۆدە**[1] / gîrode/: ئاوەڵناو. گیرەوە: ١. گرفتار ٢. خووپێگرتوو؛ ئالوودە ٣. هۆگر؛ ئۆگر ٤. ئەڤیندار ≡ ١. گرفتار ٢. مُعتاد ٣. اُنس گرفته ۴. علاقه‌مند

**. گیرۆدە**[2]: پاشەوشە. تووشیار؛ گرفتار ‹منیش یەکێ لەو تەماشاکەرانەم/ دڵگیرۆدەی جوانیی ئەم شێوارانەم «گۆران»› ≡ ـ بند؛ گرفتار

**گیرۆدەیی** / gîrodeyî/: ناو. ١. گرفتاری ٢. ئۆگری ≡ ١. گرفتاری ٢. علاقه‌مندی

**گیرۆیی** / gîroyî/: ناو. ١. تووشیاری؛ گرفتاری ٢. چۆنیەتی گرتنەوەی نەخۆشی ☰ ١. گرفتاری ٢. سرایت بیماری

**گیرە** / gîre/: ناو. ١. شەددە (لە سەر پیت) ٢. جەڕ و مەنگەنەی پیشەسازان ٣. گیرگە؛ کەلپ؛ ددانی پێشەوە ٤. کورسی قورعان ٥. ئامرازی درگا لە پشتەوە داخستن، جگە لە قفڵ ٦. نانی تێکەڵاو لە گەنم و هەرزن و جۆ ٧. ئاڵقەی بەن لە ڕەشماڵدا بۆ گوریس پێ‌قایم کردن ٨. تووشیاری؛ گرفتاری ٩. ئامرازێکی جۆلایی ١٠. تێلی سەر ١١. هەر جۆرە ئامرازی گرتن ☰ ١. تشدید (روی حرف) ٢. منگنه ٣. دندان پیشین ۴. رحل قرآن ۵. رزه‌ی در از داخل ۶. نان آمیخته از گندم و ارزن و جو ٧. حلقه‌های سیاه‌چادر ٨. گرفتاری ٩. از ابزار بافندگی ١٠. گیره‌ی سر ١١. گیره

**گیرەم** / gîrem/: ☜ **گریمان**

**گیرەوە** / gîrewe/: ☜ **گیرۆدە**[1]

**گیرەییش** / gîreyîş/: ☜ **گرەوتش**

**گیرهە** / gîrhe/: ناو. ١. بنەنیش؛ ملت؛ ڕەوتی نیشتنە بن ٢. بلغ؛ بەلخ؛ جرمی ڕەق بووی ئاو ☰ ١. رسوب ٢. رسوب سخت شده‌ی آب

**گیری**[1] / gîrî/: ناو. تامی گەرووگر ☰ مزه‌ی گلوگیر

**ـ گیری**[2]: پاشەوشە. گرتن؛ بەند کردن ‹دڵگیری؛ دەسگیری؛ ماسی‌گیری› ☰ ـ گیری

**گیریاگ** / gîryag/: ☜ **گیراو**

**گیریان** / gîryan/: ☜ **گیران**

**گیریان.گیریان** / gîryan gîryan/: ناو. گەمەیەکی بە کۆمەڵە، دەبنە دوو دەستەوە، شوێنێ بۆ داڵ دیاری دەکرێ و دەستەیەک لە دەوروبەرەوە دێن، دەبێ بڕۆنە نێو داڵەوە، ئەو دەستەکە دەبێ بیانگرن و نەهێڵن ☰ از بازی‌های گروهی

**گیریاو** / gîryaw/: ☜ **گیراو**

**گیریای** / gîryay/: چاوگ. بەستران؛ گیران ☰ مسدود شدن

**گیریاییش** / gîryayîş/: ☜ **گرەوتش**

**گیریست** / gîrîst/: ☜ **گری**

**گیرین** / gîrîn/: ☜ **گریان**[1]

**گیڕ**[1] / gîř/: ناو. ١. فاڵ؛ خیرە ٢. ملە؛ کەل ٣. شیوەڵەی نێوان دو کێو ٤. کیز؛ بەردەڵان ☰ ١. فال ٢. گردنه ٣. درّه ۴. سنگلاخ

**گیڕ**[2]: ئاوەڵناو. ١. چیڕ؛ بەقەوەت ٢. بەکێش ٣. زۆرویژ ٤. چەق؛ سەرسەخت لە سەوداا ☰ ١. نیرومند ٢. کشدار ٣. وراج ۴. سرسخت در مُعامله

**گیڕزان** / gîřzan/: ناو. فالگرەوە ☰ فالبین

**گیڕە** / gîře/: ناو. ١. چەقە و چەنەی زۆر ٢. تەشقەڵە؛ گەڕ ☰ ١. رودەدرازی ٢. شلتاق

**گیڕەگیڕ** / gîřegîř/: ناو. دژواری و سەختی ‹بە گیرەگیڕ نەجاتمان بوو «هەژار؛ چێشتی مجێور»› ☰ سختی و مشقت

**گیڕەونیڕە** / gîře w nîře/: ناو. گەڕ و گێچەڵ ‹بە هەزار گیرەونیرە و سوێند کە ئێمە هەواڵی خۆتین، دەریهێنا و هاتەوە لامان «هەژار؛ چێشتی مجێور»› ☰ شلتاق و دردسر

**گیز**[1] / gîz/: ناو. ١. ☜ **گویز**[1]**ـ١** ٢. ☜ **گێزـ٢** ٣. پرچ؛ کەزی؛ کەزیە ٤. کاری ڕاتڵەکاندن؛ ژەندن (وەک: مەشکە و ...) ☰ ١. ☜ **گویز**[1]**ـ١** ٢. ☜ **گێزـ٢** ٣. گیسو ۴. عمل به هم‌زدن مایع

**گیز**[2]: ئاوەڵناو. ١. مەست؛ سەرخۆش ‹ئەو دەرمانە گیزمی کرد› ٢. تێر؛ تژی ☰ ١. مست ٢. سیر

⊡ **گیز هەڵوتسان**: با کردن و هەڵمسان لە بەر زۆرخۆری ☰ باد کردن از پُرخوری

**گیز**[3]: دەنگەناو. ١. دەنگی باریک وەک دەنگی سەماوەر و کەتری ٢. دەنگی ڕۆیشتنی گوللە ☰ ١. صدای نازک مانند صدای سماور ٢. صدای رفتن گلوله

**گیزان** / gîzan/: ☜ **گوێزان**[2]**ـ١**

**گیزک** / gîzik/: ناو. ئیسۆت؛ بیبار ⚑ فلفل

**گیزگیزه** / gîzgîze/: ناو. مزراح؛ مزراق ⚑ گردنا

**گیزلی** / gîzlî/: ☜ **گوزلی**

**گیزمل** / gîzmil/: ☜ **گیزەمل**

**گیزمه** / gîzme/: ناو. چەکمە ⚑ چکمه

**گیزنای** / gîznay/: چاوگ. گیزەگیز کردن ⚑ وزـ وز کردن

**گیزوگوڵەنگ** / gîz û guleng/: ☜ **گیزوگولینگ**

**گیزه** / gîze/: دەنگەناو. جیـزە؛ ویـزە؛ دەنگـی زۆر باریکی (وەک: دەنگی مێشووله) ⚑ وِز وِز

**گیزەگیـز** / gîzegîz/: دەنگەناو. دەنگەدەنگی باریکی گولله و مێش و سەماوەر (بە گیزەگیز ڕۆیشت) ⚑ صدای وِز وِز پیاپی

**گیزەڵ** / gîzeł/: ئاوەڵناو. [پلار] دایم قەڵس و جـاڕز ⚑ آتشی مزاج

**گیـزین** / gîzîn/: چاوگ. تلانەوە؛ تلان؛ تلینـەوە ⚑ غلتیدن

**گیژ** / gîj/: ☜ **گۆیژ**

**گیژاڵ** / gîjał/: ☜ **گیفژاڵ**

**گیژایەتی** / gîjayetî/: ☜ **گێژین**

**گیژن** / gîjin/: ☜ **گریژەنه**

**گیژەله** / gîjele/: ☜ **گۆیژ**

**گیژەڵه** / gîjełe/: ☜ **گۆیژ**

**گیس** / gîs/: ناو. پرچ؛ گیز؛ پووڕی سەر ⚑ گیسو

**گیسک** / gîsk/: ناو. گێسک؛ بەچکە بزنی لـە شـیر بڕدراو ⚑ چپش؛ بُزغالەی از شیر بُریده

▣ **گیسکە ناودێیی:** [کنایه] پیاوی تۆلاز و ژنانیله ⚑ مرد چشم‌چران و خالەزنک

**گیسکی هەیاس:** [کنایه، پلار] کەسێک کە لـە بـەر ترس گەشە نەکات ⚑ کسی کـه از تـرس درجـا می‌زند

**گیسک** / gîsik/: نـاو. کەزی؛ پـرچ؛ پـۆڕی سـەر ⚑ زُلف

▣ **گیسک لیل:** کـەزی لـوول و بـه مـۆنج ⚑ زُلـف فرفری و موجدار

**گیسکەزا** / gîskeza/: نـاو. گێسـکەزاو؛ گێسـکەزا؛ بێچووی بزنێ کە بە بێژۆکی زاوە ⚑ بُزغالەی بُز دو ساله

**گیسکەڵ** / gîskeł/: نـاو. گیسـکی لـەڕ و سـووک (نەفەرمووی گیسکەڵێ یـا قەڵـغەکۆنێ/ ئـەبێ بزنـێ زەلام بێ و نەختێ ڕیش پان! «قانع») ⚑ بُز لاغر

**گیسن** / gîsin/: ☜ **گاواسن**

**گیسنای** / gîsnay/: چـاوگ. ئایساندن؛ پـێ‌کـردنی ئاگر ⚑ افروختن

**گیسـنەچڕ** / gîsneçiř/: نـاو. گرێوەغـار؛ ملـەی ڕاکردن ⚑ مسابقەی دو

**گیسەنه** / gîsene/: ناو. پێ‌کراوی ئاگر ⚑ افروختگی

**گیسی** / gîsî/: ناو. زنجیره کێو ⚑ رشته‌کوه

**گیسیایەنه** / gîsyayene/: چاوگ. ئایسان؛ پێ‌بوون ⚑ افروخته شدن

**گیشت** / gîşt/: ناو. قامک؛ ئەنگووس ⚑ انگشت

▣ **گیشتا قلینج** تووته؛ تبلاگچکه ⚑ خنصر؛ انگشت کوچکه

**گیشتا میۆنـەن:** نـاو. زەڕنەقووتـە؛ تلیـا نـاوین ⚑ انگشت وسطی

**گیشتن** / gîştin/: ☜ **گەیشتن**

**گیشتۆنه** / gîştone/: ☜ **گشتانه**

**گیشه** / gîşe/: ناو. گێشە: ١. تایه؛ کۆمەڵێ باقـەی لە سەر یەک داندراوی گیا و خەڵـه لـه مـەزرا ٢. کۆمای گەوره و زل له باقەگیا بۆ ئالفی زسـتانەی ئاژەڵ ⚑ ١. تودەی بسته‌های غله یا گیاه درویـده در مزرعـه ٢. تـودەی انباشـتەی گیـاه بـرای علوفـەی زمستان

**گیشەگەنم** / gîşegenim/: نـاو. شارۆ؛ چەند باقـەی دروراو ⚑ دسته‌ای گندم دروشده

**گیف** / gîf/: ☜ **گیف**

**گیڤان / gîfan/:** ☜ **گیرفان**

**گیڤک / gîfk/:** ☜ **گوفك ـ١**

**گیڤک / gîfik/:** ناو. گیڤک: ١. ڕیشووی شەدە و پێچ ٢. ڕیشووی زین بۆ جوانی ٣. پلکەی دەسماڵی ژنانە ☰ ١. شرابەی دستار ٢. شرابەی زین ٣. دنبالەی سرپوش زنانە

**گیڤەلان / gîfelan/:** ☜ **گوفك ـ١**

**گیڤەلانک / gîfelanik/:** ☜ **گوفك ـ١**

**گیڤ[1] / gîv/:** ناو. گیڤ؛ ڕیشووی بادروا ☰ شرابەی تابدادە

**گیڤ[2]:** ئاوەڵناو. گیڤ؛ ئامادە و تەیار ☰ مُهیا

▣ **خۆ گیڤ کردن:** ١. خۆ تەیار کردن ٢. خۆ پفدان (زۆرتر پەلەور دەیکا) ‹گاهێ شاعیر چەشنی بۆقلە، خۆی تەواوی گیڤ ئەکا/ کەوتە ناو بەحری خەیاڵۆ، چەندە شاتە و زیف ئەکا! «قانع»› ☰ ١. خود را مُهیا کردن ٢. خود را پُف دادن (پرندگان)

**گیڤالە / gîvale/:** ناو. ١. دەستە مرۆیەک ٢. تیپی سواران؛ دەستەسوار ☰ ١. جمعی از انسان‌ها ٢. تیپ سواران

**گیڤاندن / gîvandin/:** چاوگ. گیڤانن: ١. گیڤە هاتن ٢. توند تێ‌پەڕین و دەرچوون ‹بە لای پۆلیسدا گیڤاندی و چوو› ☰ ١. صدا دادن ٢. جستن و دررفتن

**گیڤانن / gîvanin/:** ☜ **گیڤاندن**

**گیڤڕ / gîvir̄/:** ناو. گڤر؛ گیوڕ؛ گوربە؛ پشیلەی نێر ☰ گُربەی نر

**گیڤژاڵ / gîvjał/:** ناو. گیژاڵ؛ کیڤژاڵ؛ قرژاڵ؛ قرژانگ ☰ خرچنگ

**گیڤژاڵە / gîvjałe/:** ناو. برجی قرژاڵ لە ئاسمان ☰ بُرج سرطان

**گیڤک / gîvik/:** ☜ **گیفك**

**گیڤگیڤە / gîvgîve/:** ناو. گیزگیزە؛ قۆڕقۆڕە ☰ گردنای توخالی

**گیڤنای / gîvnay/:** چاوگ. گڤە کردن ☰ گِزـگِز کردن

**گیڤە / gîve/:** دەنگەناو. دەنگی بەردی بەتەوژم ئاویتراو یان هەر شتێکی زۆر خێرا کە تێپەڕێ ☰ صدای پرتاب شدن

▣ **گیڤەی سمێڵی کەسێک هاتن:** *[مەجاز]* زۆر لە سەرکەیف و خۆشحاڵ بوون ☰ بسیار سرحال و شاد بودن

**گیگلو / gîg(i)lû/:** ☜ **گوخلێتکە**

**گیگلە / gîg(i)le/:** ☜ **گوخلێتکە**

**گیل / gîl/:** ☜ **گڵ ـ١**

**گیلاخە / gîlaxe/:** ناو. گیایەکە بەهاران دەڕوێ و دەخورێ ☰ گیاهی خوراکی

**گیلاس / gîlas/:** ☜ **گێلاس**

**گیلک / gîlik/:** ناو. *[شووروەیی]* بەلووکە؛ قیتکە ☰ چوچولە

**گیلە / gîle/:** ☜ **گلەیی**

**گیلەبەنا / gîlebena/:** ناو. خۆراکێکە لە ماست و قەزوان ☰ خوراکی از ماست و پستەی کوهی

**گیم / gîm/:** ناو. ١. باقەبێن؛ باغەبێن ٢. بەندی بەستنی باوەشێ لە دەغڵ ☰ ١. گیاه مخصوص بستن علوفە ٢. بندِ بستن تودەی درو شدە از غلە

**گین[1] / gîn/:** ☜ **گوان[2]**

**ـ گین[2]:** پاشگر. ١. ـ دار؛ خاوەنی ئەو شتە ‹خەمگین؛ شەرمگین› ٢. ـ یین ‹دواگین؛ پیاگین› ☰ ١و٢. ـ گین

**گیندال / gîndal/:** ناو. گیادانە؛ گیایەکە ☰ گیاهی است

**گینگل / gîngil/:** ☜ **گینگڵ**

**گینگڵ / gîngił/:** ناو. جینگڵ؛ گینگل؛ تەکان؛ جووڵە ‹گینگڵێکی دا› ☰ تکان؛ حرکت

**گینگەڵە / gîngełe/:** ناو. خولیا؛ کەڵکەڵە ☰ هوا و

هوس

**گینۆ** / gîno/: ناو. زەرتک؛ گیازەرتک 🇮🇷 گیاهی که از آن رنگ زرد می‌گیرند

**گیوا** / gîwa/: ☜ **گیا**

**گیواو** / gîwaw/: ☜ **گیا**

**گیوتین** / gîyutîn/: ناو. کەرستەی پێکوشتن بە تێخەیەکی تیژ و قورسەوە کە لە ناوکاری چوارچێوەیەکدا لە سەرەوە بەر دەبێتەوە و مل دەپەڕێنێ 🇮🇷 گیوتین

**گیوە** / gîwe/: ناو. ١. جۆرێ کلاشی بن چەرم ٢. نۆرە؛ باو 🇮🇷 ١. گیوه ٢. نوبت

**گیوەگیر** / gîwegîr/: ناو. نۆرەگر 🇮🇷 نوبت‌گیر

**گیوەگیرە** / gîwegîre/: ناو. نۆرەگری 🇮🇷 نوبت‌گیری

**گیوەگیو** / gîwegîw/: ناو. گێژەگێژ؛ قسەی زۆر بێ‌تام 🇮🇷 تُرَّهات؛ حرف مفت

**گیومە** / g(i)yûme/: ناو. دووکەوان؛ جووت‌کەوان؛ نیشانەیەکی خالبەندی بە شێوەی «» بۆ: *ئەلف)* دانانی قسەی کەسێک جگە لە نووسەر *ب)* دەرخستن و زەق کردنەوەی وشە یان دەستەواژەیەک 🇮🇷 گیومه

**گیە** / g(i)ye/: ناو. گەدە؛ عوور؛ کرش 🇮🇷 شکمبه

**گیەڵ** / g(i)yeł/: ناو. هەرزن؛ ئەرزن 🇮🇷 ارزن

**گیهان** / gîhan/: ☜ **گەیشتن**

**گیهانەک** / gîhanek/: ناو. قۆناغ؛ مەنزڵ ‹گیهانەک ب گیهانەک دچوو› 🇮🇷 منزلگه؛ مرحله

**گیهەڤ** / gîhev/: ناو. ١. پەش؛ پشک ٢. بەخشش 🇮🇷 ١. سهم؛ نصیب ٢. بخشش

**گێ**[1] / gê/: ناو. ١. ☜ **گوێ** ٢. گاف؛ ناوی پیتی بیست‌وسێهەمی ئەلفوبێی زمانی کوردی 🇮🇷 ١. ☜ **گوێ** ٢. گاف؛ نام بیست و سومین حرف الفبای زبان کُردی

**گێ**[2]: ناوەڵناو. گ؛ گش 🇮🇷 همه

**ـ گێ**[3]: پاشەوشە. گایێن؛ بکەر ‹کەرگێ؛ شێتی عاقڵ‌گێ «مەسەل»› 🇮🇷 گاینده

**گێپەڕ** / gêpeř/: ناو. گێپەڕە: ١. ئەستوورایی؛ کۆتەرە ٢. ئەستوورایی ئەستۆ 🇮🇷 ١. قُطر ٢. کلفتی گردن

**گێپەڕە** / gêpeře/: ☜ **گێپەڕ**

**گێتکە** / gêtke/: ناو. کیتکە؛ گێتە؛ کولێرەی هەرزن 🇮🇷 گرده‌ی ارزن

**گێتە**[1] / gête/: ☜ **گێتکە**

**گێتە**[2]: ناوەڵناو. بەرگ‌شڕ؛ شڕەبار 🇮🇷 ژنده‌پوش

**گێتی** / gêtî/: ناو. دنیا؛ جیهان 🇮🇷 گیتی

**گێتێ** / gêtê/: ناو. کوولێرە 🇮🇷 گرده نان

**گێج**[1] / gêc/: ناو. سووڕ؛ خول 🇮🇷 چرخ

▣ **گێج خواردن**: ١. سەرگێج بوون ٢. سووڕانەوە؛ خول خواردن ٣. سووڕانەوەی با یان ئاو بە دەوری خۆدا 🇮🇷 ١. گیج رفتن ٢. چرخیدن ٣. چرخیدن باد و آب

**گێج دان**: سووڕاندن 🇮🇷 چرخاندن

**گێج**[2] / gêc/: ☜ **گێژ**

**گێجاو** / gêcaw/: ☜ **گێژاو**

**گێجنای** / gêcnay/: چاوگ. گێج دان 🇮🇷 چرخاندن

**گێجەبا** / gêceba/: ☜ **گێژەڵووکە**

**گێجەگێج** / gêcegêc/: ☜ **گێژەگێژ**

**گێجەڵووکە** / gêcełûke/: ☜ **گێژەڵووکە**

**گێجەنە** / gêcene/: ☜ **گرێژەنە**

**گێجی** / gêcî/: ☜ **گێژی**

**گێجیای** / gêcyay/: چاوگ. گێج دران 🇮🇷 چرخانده شدن

**گێجیە** / gêcye/: ☜ **گێژاو**

**گێچ** / gêç/: ☜ **گەچ**

**گێچاو** / gêçaw/: ناو. دۆغاو؛ دۆخاو 🇮🇷 دوغاب

**گێچکار** / gêçkar/: ☜ **گەچکار**

**گێچکاری** / gêçkarî/: ☜ **گەچکاری ـ١**

**گێچکە** / gêçke/: ناو. ١. ☜ **گوێ** ٢. سوور 🇮🇷 ١.

☜ گوێ ٢. چرخش

**گێچووک** / gêçûk/: ☜ **گوێچکە**

**گێچەڵ** / gêçeł/: ناو. ١. گەڕ؛ دەبە؛ تەشقەڵە ٢. پەتەر؛ ڕووشە؛ شەڕ؛ شوێن یان بارودۆخێ کە ڕزگار بوونی بۆ نییە ‹ئەستێرە و مانگ و ڕۆژ لە عاسمانانن/ هۆی گێچەڵ و مشتومڕی زانایانن «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ☰ ١. شلتاق ٢. هَچَل

▣ **گێچەڵ دانە دەستی کەسێکەوە:** *[مەجاز]* شەڕ و بشێوی بۆ کەسێ دروست کردن ☰ دردسر برای کسی درست کردن

**گێچەڵ کردن:** گەڕ تێخستن ☰ شلتاق کردن

**گێچەڵ نانەوە:** *[مەجاز]* گیر و گرفت دروست کردن بە هۆی گزیبازی ☰ بازی سر کسی درآوردن

**گێچەڵبەقوون** / gêçełbeqûn/: ناوەڵناو. *[پلار]* گێچەڵوەقنگ؛ سەربەگێچەڵ: ١. دنەدەری خەڵک ٢. هۆی ئازار و گرفتاری ☰ ١. تحریک‌کننده ٢. دردسرساز

**گێچەڵوەقنگ** / gêçełweqing/: ☜ **گێچەڵبەقوون**

**گێچەڵی**[١] / gêçeři/: ناو. کەلوی خوری ☰ آغندەی پشم

**گێچەڵی**[٢]: ناوەڵناو. کێشەدار؛ گێچەڵوەقنگ؛ گەڕتێئالاو ‹ئەم زەوییە گێچەڵییە، مەیسێنە!› ☰ مُشکلدار

**گێدوک** / gêduk/: ناو. گێدۆک: ١. گەوە؛ ناوقەدی کێو ٢. ڕێ بەگەوەی کێودا ☰ ١. کمرکش کوه ٢. مسیر در کمرکش کوه

**گێدۆک** / gêdok/: ☜ **گێدوک**

**گێر**[١] / gêr/: ناو. ١. بەست؛ بنگووس ٢. ☜ **گوێلە-١** ☰ ١. وجب ٢. ☜ **گوێلە-١**

**گێر**[٢]: ناوەڵناو. ١. قەڵەوی پان و پۆڕ ٢. حەپەساو؛ واق ـ وڕماو ٣. لە جێ چەقیو و بێ توانای بزووتنەوە ☰ ١. چاق و پهن ٢. حیرت‌زده ٣. میخکوب شده

**گێراز** / gêraz/: ناو. گێراز؛ بەلالووکە کێویلە ☰ آلبالوی کوهی

**گێراڤ** / gêrav/: ناو. ١. لاسا؛ لاسایی؛ دەمەلاسکە ٢. کاری دروست کردنی شتێ لە ڕووی نموونەکەی ٣. کاری دروست کردنی شتی درۆیین، بەتایبەت لێ دانی ناقانوونی بەڵگەگەلی ڕەسمیی بایەخدار ‹وی دخواست ناسنامەیەکە گێراڤ بکە› ☰ ١. تقلید ٢. الگوبرداری ٣. جعل

▣ **گێراڤ کرن:** ١. لاسایی کردن ٢. بە گوێرەی نموونە دروست کردن ٣. جەعل کردن؛ ساختە کردن ☰ ١. تقلید کردن ٢. طبق الگو درست کردن ٣. جعل کردن

**گێرانی** / gêranî/: ناوەڵناو. بالغبوو؛ پێگەیشتوو ☰ بالغ شده؛ به سن رشد رسیده

▣ **گێرانی بوون:** بالغ بوون ☰ بالغ شدن

**گێرتەی** / gêrtey/: چاوگ. گرتن ☰ گرفتن

**گێرڤان** / gêrvan/: ☜ **گێرەوان**

**گێرک** / gêrik/: ناو. ١. مێرووله؛ مرۆچە؛ مێلووره ٢. گێرکە؛ مێرووە زەردەی ورد ☰ ١. مورچە ٢. مورچەی زرد ریز

**گێرکە** / gêrke/: ☜ **گێرک -٢**

**گێرم** / gêrim/: ناو. شۆروا؛ شۆربە ☰ شوربا

**گێرما** / gêrma/: ☜ **گەرما**

**گێرمەکێش** / gêrmekêş/: ناو. کێشەکێش ☰ کشاکش

**گێرمی** / gêrmî/: ناو. شێوی دانووله ☰ آش گندم

**گێروفەن** / gêr û fen/: ناو. شیاوی؛ ژیهاتوویی ☰ لیاقت

**گێرۆدەیی** / gêrodeyî/: ناو. داکەفتگی ☰ زمینگیری

**گێرووسە** / gêrûse/: ناو. گێرووشە؛ دەستاڕ؛ کرە ☰ دستاس

**گێڕووشه** / gêrûşe/: ☜ **گێرووسه**

**گێره** / gêre/: ناو. ١. هۆڵـه؛ کـاری کوتـان و ورد کردنی دەغـڵ و گیـا بـه پـێ لێنـان و شـێلانی حەیوانات ‹هەر ئەو خەرمانە و هەر ئـەو گێـره بـوون «مەسەل»› ٢. گلی؛ گلە؛ شکات ☰ ١. خرمنکوبی وسیلەی حیوانات ٢. گِله؛ شکایت

◙ **گێرەی قوڕێ**: کاری کوتانی جـێ جێخـوون بـه گاگەل ☰ عمـل جـای خـرمن را بـا سـم دامهـا کوبیدن

◙ **گێره کردن**: ١. بە سـم کوتـانی دەخـڵ و گیـا ‹گێره بە بزن نـاکرێ «مەسـەل»› ٢. *[کینایە]* بـه سەر قوڕدا هاتووچۆ کردن ☰ ١. کوبیدن خـرمن ٢. رفت و آمد کردن در گل

**گێرەشێوێن** / gêreşêwên/: ناو. *[کینایە]* ئـاژاوەچی؛ فتنه ‹گێرەشێوێنێ کە کای کۆنی بە بادا لـه کنـت/ چاکە هەر لێیخوری سەیری دەم و کـاوێژی نەکـەی «شوکری فەزڵی»› ☰ آشوبگر

**گێرەڤان** / gêrevan/: ☜ **گێرەوان**

**گێرەکراو** / gêrek(i)raw/: ئاوەڵناو. هـۆڵیکـری ☰ کوبیده (خرمن)

**گێرەکەر** / gêreker/: ئاوەڵناو. لێهـاتوو لـه گێـره کردندا ‹کاشکی گایەک بـێ کـه گێرەکـەر بـێ/ یـا بەستەزمانێ کە بارەبەر بێ «موفتی پێنجوێنی»› ☰ ماهر و توانا در خرمنکوبی

**گێرەنەکەر** / gêreneker/: نـاو. *[کینایـە]* تەمـەڵ؛ تەوەزەل ☰ تنبل

**گێـرەوان** / gêrewan/: نـاو. گێرڤـان؛ گێرەڤـان؛ کەسـێ کـە گـا و گـۆل لـە خـەرمان کوتانـدا لێدەخوڕێ ☰ کارگر خرمنکوبی

**گێرەوکێشە** / gêre w kêşe/: ناو. ١. کاری کلـۆش بردنە سـەر خـەرمان و گێـره کـردنی ٢. *[مەجاز]* گرفتاری؛ دەردیسەری ☰ ١. سپاری بە خرمن بردن و کوبیدن ٢. گرفتاری؛ مشکل

**گێڕ**[1] / gêř/: ئاوەڵناو. ١. خوار و خێچ ٢. سمت-لـه جێ چوو ‹لەبار و قیت و قۆزە خـاوەنی زێـڕ/ ئەگـەر کووڕە و ئەگەر گۆجە و شەل و گێڕ «هـێمن»› ☰ ١. کج و ناهموار ٢. لگن از جا دررفته

◙ **گێڕ بوون**: ١. خوار و خێچ بوون ٢. ئێسکی ڕان لە جێ دەرچـوون ٣. وێسـتان بەشـتێکەوە ٤. نەڕۆیشـتن و مانـەوە لـە شـوێنێ ☰ ١. کـج و ناهموار شدن ٢. استخوان ران در رفـتن ٣. درگیـر چیزی شدن ٤. جایی ماندن و نرفتن

• **گێڕ**[2]: پاشەوشە. بگێڕ؛ پێکهـێن ‹بەزمگێـڕ؛ کارگێـڕ؛ شۆڕشگێڕ؛ ئاش‌گێڕ› ☰ ـگردان

**گێڕان** / gêřan/: چاوگ. تێـەڕ. //گێـڕات؛ دەگێـڕێ؛ بگێڕە// ١. گەڕاندن؛ گەردش پـێ‌کـردن ٢. کـار پێ‌کردن و بـه سـەر ڕاگەیشـتن ‹ئـەم کۆشـک و دەزگایە کە پۆشتەی تفاقە/ بێگانە ئەیگێڕێ و بـە نـاو هی عیراقە «گـۆران»› ٣. خـول پـێ‌دان و بـەڕێوە بـردن (وەک: سـەربان بـه بـاگردان شـێلان) ٤. پەستاوتن (بەرگن بۆ ڕایـەخ و پەسـتەک) ٥. خلـۆر کردنەوە ٦. وە پاش خستن ☰ ١. بە گردش بـردن ٢. گردانـدن ٣. چرخانـدن ٤. بـا پـا مالیـدن (نمـد) ٥. غلتاندن ٦. به تعویق انداختن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەگێڕان

**گێڕاندن** / gêřandin/: چاوگ. گێڕانن: ١. گەڕاندن ٢. خستنە کار ٣. گێڕ کردن ☰ ١. گردش دادن ٢. به کار انداختن ٣. کج کردن

**گێڕاندنـەوە** / gêřand(i)newe/: چـاوگ. تێـەڕ. //گێڕاندتـەوە؛ دەگێڕێتـەوە؛ بگێـڕەوە// گێڕاننـەوە؛ گێڕانەوە: ١. هەڵگەڕاندنەوە ٢. گەڕاندنەوە؛ بـاس کردنی قسەی گوتراو ٣. حیکایـەت گـوتن ☰ ١. بازگرداندن ٢. بازگو کردن ٣. داستان گفتن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: ـــ/ چـاوگی نـەرێنی: نەگێڕاندنەوە

**گێڕانن** / gêřanin/: ☜ **گێڕاندن**

**گێڕاننەوە / gêřannewe/:** ☜ **گێڕاندنەوە**

**گێڕانەوە / gêřanewe/:** ☜ **گێڕاندنەوە**

**گێڕایش / gêřayiş/:** ناو. گەڕیدەیی؛ جیهان‌گەردی ☰ جهانگردی

**گێڕاییش / gêřayîş/:** چاوگ. لە شوێن گەڕان بۆ پەیدا کردن ☰ جستجو کردن

**گێڕزان / gêřzan/:** ناو. ڕەمڵ؛ فاڵگر؛ قەپاڵگر؛ خێپک ☰ فالبین؛ رمال

**گێڕک / gêřik/:** ☜ **گێژاو**

**گێڕگێڕ / gêřgêř/:** ناو. بەردەڵان؛ بەردانی؛ بەرداوی؛ ڕێخەڵان ☰ سنگلاخ

**گێڕنای / gêřnay/:** چاوگ. خوار و خێچ کردن ☰ کج کردن

**گێڕ و وێڕ / gêř û wêř/:** ناوەڵناو. خوار و خێچ ☰ کج و کوله

**گێڕەوە**[1] **/ gêřewe/:** ناو. ۱. هەرچی پێش لە ڕۆیشتن دەگرێ ۲. کەسێ باری ڕووداو یان بێژراو دووپاتە دەکاتەوە ☰ ۱. مانع ۲. بازگوکننده

**ـ گێڕەوە**[2]**:** پاشەوشە. پاریزەر ‹بەلاگێڕەوە› ☰ ـگردان

**گێڕی**[1] **/ gêřî/:** ناو. ۱. خوار و خێچی ۲. شەلی بە هەر دوو لادا ☰ ۱. کجی و ناهمواری ۲. لنگی از دو پا

**ـ گێڕی**[2]**:** پاشەوشە. ـگەری؛ ـکەری ‹کاگێڕی؛ شۆڕشگێڕی› ☰ ـگری

**گێڕیای / gêřyay/:** چاوگ. خوار و خێچ کران ☰ کج شدن

**گێز / gêz/:** ناو. ۱. ☜ **گوێز**[1]**ـ۱** ۲. گیز؛ پشت ئەستۆ ۳. بەراورد و کاری لێکدانەوە بە بیر و خەیاڵ ٤. دەسی دەسی؛ دەستاودەست ٥. ڕیشووی شەدە و مێزەر ٦. گیز؛ کێز؛ کاری لێک‌دان و ژەنینی تراو (وەک: مەشکە و ...) ☰ ۱. ☜ **گوێز**[1]**ـ۱** ۲. قفا؛ پشت گردن ۳. برآورد ۴. طفره ۵. شرابه؛ منگولەی دستار ۶. کار به هم زدن مایع

**گێزان**[1] **/ gêzan/:** چاوگ. کیان؛ کەی؛ کێزان؛ ڕاتلەکان (تراو لە دەفردا) ☰ به هم زده شدن (مایع)

**گێزان**[2]**:** ☜ **گوێزان**[2]**ـ۱**

**گێزبەل / gêzbel/:** ☜ **گێزبەلە**

**گێزبەلۆک / gêzbelok/:** ناو. بزنەڕیشە؛ جۆرێ شنگی پەلک‌درێژ ☰ نوعی شنگ

**گێزبەلە / gêzbele/:** ناو. گێزبەل؛ ئاڵەکۆک ☰ گیاهی است

**گێزر / gêzir/:** ناوەڵناو. پشت‌گوێ‌خەر؛ تەفرەدەر؛ دەستاودەست‌پێ‌کەر ☰ طفره‌رو

**گێزک / gêzik/:** ☜ **گسك**

**گێزگ / gêzig/:** ☜ **گسك**

**گێزوگوڵنگ / gêz û gułing/:** ☜ **گێزوگوڵینگ**

**گێزوگوڵنگە / gêz û gułinge/:** ☜ **گێزوگوڵینگ**

**گێزوگوڵینگ / gêz û gułîng/:** ناو. گیزوگوڵەنگ؛ گێزوگوڵنگ؛ گێزوگوڵنگە؛ گێزوگوڵینگە: ۱. ڕیشی و گوڵنگەی سەر و مێزەر ۲. *[مەجاز]* گەڵ‌وگون ☰ ۱. شرابه و منگوله ۲. عضو تناسلی مرد

**گێزوگوڵینگە / gêz û gułînge/:** ☜ **گێزوگوڵینگ**

**گێزە**[1] **/ gêze/:** ناو. ۱. سۆزە؛ گۆرانی بە سەبر لە خۆشیان ۲. ☜ **گێزەرە** ☰ ۱. ترنم از شادی ۲. ☜ **گێزەرە**

**گێزە**[2]**:** ناوەڵناو. *[کینایە]* کورتەباڵای قەڵەو ☰ کوتاه‌قد چاق

**گێزەر / gêzer/:** ناو. ۱. گزر؛ گزەر؛ گەزەر؛ کارۆت؛ کارووت؛ گزەرکی؛ یارکۆک؛ هەویج؛ ئالفەگیایەکی دووساڵانەیە بە ڕیشەی ڕاست و ئەستوور و لقی ساف و گەڵای بڵاو و گوڵی چکۆڵەی سپی کۆمەڵ وەکوو چەترەوە کە بنەکەی گرۆڤەرێکی ئەستووری نارنجی یان نارنجی مەیلەو زەردە و دەخورێ ۲. گیایەکی بن‌سپی گوڵ وەنەوشە ☰ ۱. هویج ۲. گیاهی ساقەسفید با گل بنفش

**گێزەرتەر / gêzerter/**: ناو. گیایەکە بۆ ڕەوانی باشە ☰ گیاهی مُسهل

**گێزەرە / gêzere/**: ناو. گێزە؛ گێز؛ گێز؛ پشت گەردن؛ پشت ئەستۆ ☰ قفا؛ پشت گردن

**گێزەرەمشکانە / gêzeremişkane/**: ناو. بادامەعەرزیلە ☰ بادام زمینی

**گێزەمل / gêzemil/**: ئاوەڵناو. گیزمل؛ مل ئەستوور ☰ گردن کُلُفت

**گێزی / gêzî/**: ☜ گسك

**گێژ[1] / gêj/**: ناو. ١. گێژاو؛ وەیشوومە ‹کاتێ کە یارت دیتە لات، لە گێژی خەم ئەتدا نەجات/ ... «قانع»› ٢. گێژەڵووکە ‹مەحوی قەبوولی خاتری عاتر شەمیمتە/ گەردی شیمال و گێژی جەنووب و کزەی دەبوور «نالی»› ☰ ١. گرداب ٢. گردباد

⊡ **گێژی ئەسکەندەر:** [کینایە] تەنگژەی زۆر سەخت ☰ تنگنای سخت

**گێژ[2]**: ئاوەڵناو. گیج؛ گێج؛ هوڕ؛ هەوت ☰ گیج

⊡ **گێژ بوون:** گێج بوون؛ هورمان؛ وڕمان؛ وڕ بوون؛ تاسان ☰ گیج بودن/ شدن

**گێژ دان:** ١. گێج دان؛ خولخواردن ٢. پاکەوە کردنی دەخڵ بە بێژنگ ☰ ١. چرخ خوردن ٢. بوجاری کردن غله با غربال

**گێژ کردن:** ١. تووشی سەرسووڕان کردن ٢. دەغڵ بە بێژنگ پاک کردن ٣. [کینایە] چەقەی زۆر بۆ کەسێ کردن ☰ ١. گیج کردن ٢. بوجاری کردن با غربال ٣. سر کسی را به درد آوردن

**گێژاڤ / gêjav/**: ☜ گێژاو

**گێژاڵی / gêjałî/**: ئاوەڵناو. ئاڵۆزاو؛ سەر و قژ ئاڵۆزاو ☰ ژولیده

**گێژاو / gêjaw/**: ناو. گێجاو؛ گێژاڤ؛ گرداق؛ گرداو؛ گەرداڤ؛ گەرداو؛ گێرک؛ گێژک؛ گێژەو: ١. گێجیە؛ گوری؛ گێژگەرداو؛ گێژگەردوو؛ تەندووراو؛ تەندوورەژەنە؛ تەندوورەزەنە؛ ئاشەتەندوورە؛ ئەو شوێنە لە ئاودا (ڕووبار یان زەریا) کە ئاوەکەی سووڕ دەخواتەوە ٢. [مەجاز] ڕووشە؛ وەیشوومە؛ نشووف ‹گێژاوی بەڵا› ☰ ١و٢. گرداب

**گێژداخ / gêjdax/**: ئاوەڵناو. [کینایە] سادە و ساویلکە ‹خەڵکی گێژداخ و بەردەست چووزانێ؟!› ☰ سادەلوح

**گێژک / gêjik/**: ☜ گێژاو

**گێژکە / gêjke/**: ناو. گێژەو؛ کاری پاک کردنەوەی خەڵە بە بێژنگ ☰ بوجاری غله با بیزن

**گێژکەر / gêjker/**: ئاوەڵناو. سەرسامکەر؛ سەرسووڕێنەر ☰ گیج کننده

**گێژگەرداو / gêjgerdaw/**: ☜ گێژاو ـ١

**گێژگەردوو / gêjgerdû/**: ☜ گێژاو ـ١

**گێژڵۆک / gêjłok/**: ناو. گیایەکە ☰ گیاهی است

**گێژن / gêjn/**: ناو. جێژن؛ جەژن؛ گێژنە ☰ عید

**گێژنۆک / gêjnok/**: ناو. گوڵێکە لە سەرە بەهاردا دەپشکوێ ☰ گُلی است

**گێژنە / gêjne/**: ☜ گێژن

**گێژووێژ / gêj û wêj/**: ئاوەڵناو. گێژوولکە: ١. بێهۆش؛ حۆل ٢. حەپەساو؛ واق ـ وڕماو ☰ ١. گیج و منگ ٢. مبهوت

**گێژۆک / gêjok/**: ☜ گۆیژ

**گێژوولکە / gêjûlke/**: ☜ گێژووێژ

**گێژەبا / gêjeba/**: ☜ گێژەڵووکە

**گێژەڕاو / gêjeřaw/**: ناو. ڕاوەڕێوی بەر لە بارانی پاییز ☰ شکار روباه قبل از باران پاییزی

**گێژەڤانک / gêjevanik/**: ☜ گێژەوانك

**گێژەگ / gêjeg/**: ناو. ١. خولخولە ٢. گێژی؛ وڕی ☰ ١. فرفره ٢. گیجی

**گێژەگێژ / gêjegêj/**: ناو. گێجەگێج؛ گەلحۆیی؛ کاری گەوجانە ☰ خُلبازی

**گێژەڵووکە / gêjełûke/**: ناو. گێجەلووکە؛ گێژەڵە؛ گێژەبا؛ گێجەبا؛ گردەبا؛ گژۆلەک؛ گەردەبا؛ گەردەبل؛ گەردولوول؛ گەردەلوول؛ گەردەلوور؛

باپێچ؛ گرپێچ؛ گەرەپێچ؛ گەرەپێچە؛ گەژگەرینک؛ گیدۆ؛ تەنوورە؛ باهۆز؛ زلان؛ زەمەن؛ زلون؛ زفیرک؛ بازفیرک؛ باگێجە؛ باگێژە؛ واگژە؛ واگیژە؛ بای بەقەوەتی وا کە سوور دەخوا و بەرەو پێش و سەر دەڕوا ☰ گردباد

**گێژەڵە** / gêjełe/: ☜ **گێژەڵووکە**

**گێژەن** / gêjen/: ناو. ترکزە؛ تۆکز؛ گێچەڵ ☰ پاپوش

**گێژەنگ** / gêjeng/: ناو. کەندال؛ گێژاو ☰ گرداب

**گێژەنە** / gêjene/: ☜ **گریژەنە**

**گێژەو** / gêjew/: ناو. ١. ☜ **گێژکە** ٢. ☜ **گێژاو**

**گێژەوانک** / gêjewanik/: ناو. گێژەڤانک؛ باوەخولێ؛ دایەخولێ باوەخولێ؛ مانمانەگێجێ ☰ بازیِ به دور خود چرخیدن

**گێژەوکراو** / gêjewk(i)raw/: ناو. خەڵەی لە بێژنگ‌دراو ☰ غلەی بوجاری شده

**گێژی** / gêjî/: ناو. گێجی: ١. گێژیەتی؛ چۆنیەتی سەرسووڕان ٢. نەخۆشی سەرەگێژە؛ سەرەخولێ ☰ ١. گیجی ٢. بیماری سرگیجه

**گێژین** / gêjîn/: ناو. گێژیەتی؛ گێژایەتی ☰ گیجی

**گێژیەتی** / gêjyetî/: ☜ **گێژی ـ١**

**گێست** / gêst/: ناوەڵناو. برسی؛ پرچی؛ نێز ☰ گُرسنه

⊡ **گێست مەردش**: لە برسان مردن ☰ از گُرسنگی مُردن

**گێسک** / gesk/: ☜ **گیسك**

**گێسک** / gesik/: ☜ **گسك**

**گێسکەزا** / gêskeza/: ☜ **گیسکەزا**

**گێسکەزاو** / gêskezaw/: ☜ **گیسکەزا**

**گێسن** / gêsin/: ☜ **گاواسن**

**گێسوانە** / gêswane/: ☜ **گوێسوانە**

**گێسو** / gêsû/: ناو. گێسی؛ کەزی؛ پرچ؛ پۆڕ ☰ گیسو

**گێسوبڕی** / gêsûb(i)řî/: ناوەڵناو. [کنایە] پوورکوڕکراو؛ تایبەتمەندی ژنی خراپ ☰ گیسوبُریده

**گێسی** / gêsî/: ☜ **گێسو**

**گێش** / gêş/: ناو. پۆلی باڵداران لە حەواوە ☰ دستەی پرندگان در حال پرواز

**گێشت** / gêşt/: ناو. گوست؛ ئەموست؛ تبل؛ قامک؛ کشک ☰ انگشت

**گێشکون** / gêşkun/: ناو. بە کۆمەڵ فڕینی مەلان بەرەو گەرمێن و کوێستان ☰ کوچ گروهی پرندگان

**گێشە** / gêşe/: ☜ **گیشە**

**گێڤل** / gêvil/: ☜ **گێول**

**گێل** / gêl/: ناوەڵناو. ١. حۆل؛ کەم‌ئاوەز ٢. تەمەڵ ☰ ١. ابله ٢. تنبل

⊡ **خۆ گێل کردن**: ١. خۆ حەپۆل نواندن ٢. خۆ لە شتێ لادان ‹هەر منی دی، خوەی گێل کرد!› ☰ ١. خود را به گیجی زدن ٢. خود را به کوچەی علی‌چپ زدن

**گێلاخە** / gêlaxe/: ناو. گێلەخ؛ گیلاخە؛ گیایەکە بۆ چێشت خۆشە ☰ گیاهی خورشی

**گێلاس** / gêlas/: ☜ **گێلاس**

**گێلاسی** / gêlasî/: ناو. چەرمی گلاسی ☰ نوعی چرم

**گێلان‌گێلان** / gêlangêlan/: ☜ **گەلەنگەدەن**

**گێلبزانە** / gêlb(i)zane/: ناو. گیایەکە لە بەهاردا بەر لە گشت گیایەک سەر دەردێنێ ☰ گیاهی که فصل بهار پیش از هر گیاه دیگرسبز می‌شود

**گێلک** / gêlik/: ناو. ١. ☜ **گوێرەکە** ٢. گیایەکە وەک سریش ئەچەسپێ ٣. خوری ئامادەی ڕستن ☰ ١. ☜ **گوێرەکە** ٢. گیاهی چسبناک ٣. آغند پشم

**گێلکە** / gêlke/: ناو. جۆرێ میروولەی سووری چکۆلە ☰ نوعی مورچەی قرمز ریز

**گێل‌گەوج** / gêlgewc/: ناوەڵناو. شەمەخولە؛ حەپۆل ☰ ابله

**گێلگێله / gêlgêle/**: ناو. ڕیزە گولینگەی تێکخراو بۆ سەر و شەدەی ژنان ☰ زنجیره منگوله‌ی دستار زنانه

**گێلۆکه / gêloke/**: ئاوەڵناو. گێلووکە: ١. فەقیر؛ داماو ٢. گەوج؛ تێنەگەیشتوو ☰ ١. بینوا ٢. کُندذهن

**گێلو / gêlû/**: ناو. جۆرێ گێچکاری میچی خانوو ☰ نوعی گچکاری سقف

**گێلوکه / gêlûke/**: ☜ **گێلۆکه**

**گێله ـ / gêle/**: پێشوشە. حۆل؛ کەمفام ‹گورگی فرەزان، دۆستی گێلەشوان «مەسەل»› ☰ هالو

**گێله پەڕک / gêlepeřik/**: ناو. مێرووی باڵدار ☰ مورچه‌ی بالدار

**گێلەخ / gêlex/**: ☜ **گێلاخه**

**گێلەشۆ / gêleşo/**: ناو. گێلەشۆک؛ زەنا ـ زەنا؛ چەقەچەق ☰ همهمه و جنجال

**گێلەشۆک / gêleşok/**: ☜ **گێلەشۆ**

**گێلەگێل / gêlegêl/**: ئاوەڵکار. ١. بە سەبرۆکە و هێدی ـ هێدی ٢. بە تەمەڵی و تەوەزەلییەوە ☰ ١. به آرامی ٢. با تنبلی

**گێلەوەژە / gêleweje/**: ناو. گێلێژە؛ دەردیسەر؛ گێرەوکێشە ☰ دردسر

**گێلی / gêlî/**: ناو. ١. حۆلی؛ کلکانی ٢. حەپۆلی ☰ ١. گیجی ٢. ابلهی

**گێلینگ / gêlîng/**: ناو. شەشداو ــ شەشداوی لێکهاڵاو بۆ تەونی لە سەر زەوی ☰ تارهای شش‌گانه‌ی گلیم‌بافی افقی

**گێڵ[1] / gêł/**: ناو. کاری تەتەڵە کردن؛ هەڵتەکاندن (دەغڵ و تووتن) ☰ عمل طبق کردن

**گێڵ[2]**: پاشەوشە. ـ گەڕ ‹بەرگێڵ؛ بیابانگێڵ› ☰ ـگرد

**گێڵ[3]**: پێرۆ. ← **گەشتوگێڵ**

**گێڵا / gêła/**: ئاوەڵناو. گەڕۆک؛ لە گەڕان و سووڕدان ☰ سیار

**گێڵاس / gêłas/**: ناو. گیلاس؛ گێلاس: ١. گلیاز؛ گلیاس؛ گەلاز؛ گەلاس؛ گەلاز؛ گەلاس؛ دار یان دەوەنێ بە هێشووەگوڵی سپی و گەڵای ددانەدارەوە ٢. میوەی ئەو دارە بە ڕەنگی زەرد، نارنجی یان مەیلەوڕەش کە خڕ و ئاودار و گۆشتن و شیرینە و دەخورێ ٣. گلاس؛ پەرداخ؛ قەرەس؛ لیوانی بلۆری بەتایبەت پایەدار، بۆ خواردنەوەی ئەلکولی ☰ ١تا٣. گیلاس

**گێڵان / gêłan/**: چاوگ. گەڕان؛ گەڕیان ☰ گشتن

**گێڵای / gêłay/**: چاوگ. گەڕیان؛ گێڵان ☰ گشتن

**گێڵنای / gêłnay/**: چاوگ. گەڕاندن ☰ گرداندن

**گێڵوگەشت / gêł û geşt/**: ☜ **گەشتوگێڵ**

**گێڵه / gêłe/**: ناو. گەشت ☰ گردش

**گێڵیای / gêłyay/**: چاوگ. گەڕان ☰ گشتن؛ گردیدن

**گێڵێژه / gêłêje/**: ☜ **گێلەوەژە**

**گێن / gên/**: ئامراز. وەک؛ لە تەرزی ☰ مانندِ

**گێنۆ / gêno/**: ناو. گێنوو؛ گیایەکی لاسک قالۆری و بەرز و گەڵاپان و بڕبڕەیی، بە ڕەنگی کەسکی تۆخەوە، لە گوێ چەم و دەراوان دەڕوێ و بۆگەنە ☰ سنبل بیابانی پاره‌برگ

**گێنو / gênû/**: ☜ **گێنۆ**

**گێنه / gêne/**: ☜ **گەرچەك[1]**

**گێنی / gênî/**: ☜ **گەون**

**گێوڕ / gêwiř/**: ☜ **گیڤڕ**

**گێوژ / gêwij/**: ☜ **گوێژ**

**گێوژەڕیخه / gêwjeřîxe/**: ☜ **گوێژەڕیخه**

**گێوژەزەرده / gêwjezerde/**: ☜ **گوێژەزەرده**

**گێوژەسووره / gêwjesûre/**: ☜ **گوێژەسووره**

**گێوژەکۆڵه / gêw(i)jekołe/**: ☜ **گوێژەکۆڵه**

**گێوژەمۆره / gêwjemore/**: ☜ **گوێژەڕیخه**

**گێول / gêwil/**: ناو. گێڤڵ؛ مەیل؛ واز؛ ئیشتیا؛ مرخ ‹ئیرۆ گێولێ من ل سوحبەتێ نادە› ☰ میل

**گێون / gêwin/**: ☜ **گیان[1]ـ١**

# ل

**ل / l/**: پیت. نیشانەی پیتی بیستوچوارەمی ئەلفوبێی زمانی کوردی ≡ نشانەی بیست و چهارمین حرف الفبای کردی

**ل[۱] / li/**: ناو. بیستوچوارەمین پیتی ئەلفوبێی زمانی کوردی ≡ بیستوچهارمین حرف الفبای کردی

**ل[۲]**: ئامراز. ژ؛ جه؛ له ‹شاهـ ب قەسدا کوشتنا مـن ڕم هەژاندن بێ سەبەب/ دا مه چەشمێ قەهر و خەشمێ ڕم ل دلدا کو ئەدەب «مەلای جزیری»› ≡ از

**ـ ل / il/**: پاشگر. ـــ ۆڵ ‹گـەڕل› ≡ از پسوندهای تصغیر

**لا[۱] / la/**: ناو. ۱. ڕەخ؛ ئالی ‹بە کـام لادا چـوو؟› ۲. تـوێ؛ تـوێژ ‹پـەمووم خـستۆتە لای› ۳. لایـەن؛ تەرەف ‹هەموو لایەکمان لێ گیراوە› ٤. نافـەرمانی ‹تۆ هەرچی بفـەرمووی مـن لام نییـە› ٥. شـریتی قەند؛ کەنـدری زراڤ ٦. شـیو؛ دۆڵـی تـەنگ ٧. قرقرە؛ غەرغەرە؛ تەختە کلاف ٨. ☜ **لافاو** ≡ ۱. سو؛ جانب ۲. لایه ۳. سمت؛ طرف ۴. نافرمانی ۵. نخ کله قند ۶. درّه‌ی تنگ ۷. قرقره ۸. ☜ **لافاو**

⊡ **لا بردن**: ۱. له سەر هەڵگرتن ۲. دوور کردنەوە ≡ ۱. برداشتن؛ کنار زدن ۲. دور کردن

**لا بۆ شل کردن**: ۱. بە دەمەوە دان؛ دەرفەت پێ دان ‹ئەوەندە لای بۆ شل مەکە! سواری سەرمان دەبێ› ۲. چاوپۆشی کردن بۆ ئەوەی لە لایەکەوە دەرباز بێ ‹لای بۆ شل کە با هەڵێ› ≡ ۱. میدان دادن ۲. اجازه به فرار دادن

**لا چوون**: ۱. چوونە کـەنار؛ بـە لایەکـدا کـەوتن (پـەردە و پۆشـەنی شـتێک) ‹کـە پـەردە لا چـوو ئاشکرا ئەبێ/ ئەمانە لـە تـۆ ئێجگـار دوور کـەوتن! «گۆران»› ۲. شوێنێ چۆڵ کردن ‹لێـرە لا چـۆ، تەڕ نەبی› ۳. نەمان ‹لەسەر ڕووی نـەما زینـەتی ئیهتیزاز/ لە سەر لێوی لا چـوو بـزەی نـووری نـاز «گۆران»› ٤. گوم بوون؛ لە بەر چـاو ون بـوون ‹سەلامم کرد و فەرمووی پـێم، بـە لـەعلی لێـوی یاقوتیی:/ هەتیو لا چۆ لە بەر چاوم! منیش ئێژم بە مـەزبووتی ... «نـاری»› ٥. سـڕیانەوە؛ پـاک بوونەوە ‹کراسەکەم لەکەی لێ کـەوتبوو، شـۆردم لاچوو› ≡ ۱. کنـار زدن ۲. کنـار رفـتن ۳. ستُرده شدن ۴. گُم شدن؛ کنار رفتن ۵. پاک شدن

**لا دان**: ۱. *(کنایه)* دیەنی و بوونە میوان ‹وەرە، لا دە لامان!› ۲. لاڕێ بوون؛ کلا بوون ‹ئەگەر پێت خۆشە هەروا بتپەرستم/ نەکـەی لا دەی لـە بـاوی کوردەواری! «هـێمن»› ۳. وێستان لە نێو ڕێ بۆ پێداویستی یـان حەسانەوە ‹نیوەڕۆیەکی زۆر گەرم بوو، لە دەم چۆمێک لامان دا. هـەر کەسە بلاو بووین مەلە بکەین «هەژار، چێشتی مجێور»› ٤. وە لا دان؛ دانـە لاوە ‹لا دە دەسـرۆکەیی

هەوری لە جەبین/ دەرکەویَ شەمس و قەمەر، نوور و زیا «نالی») ☰ ۱. توقف کردن و مهمان شدن ۲. مُنحرف شدن ۳. توقف کردن ۴. کنار زدن

**لا کردن:** سەروبەر کردنی تیر بۆ ئامانج؛ لە ئامانج نەکەوتنی تیر ☰ منحرف شدن تیر از هدف

**لا کردنەوە:** ۱. لاوە کردن؛ ئاوڕ دانەوە ‹ڕێ بە پێچی کۆچ، پێچ ئەکاتەوە/ لەیلێ کافرە ، لا ناکاتەوە «فۆلکلۆر»› ۲. گەڕانەوە؛ هەڵگەڕیانەوە ☰ ۱. واپس نگریستن ۲. بازگشتن

**لا لە کەسێ/ شتێ کردنەوە:** /کینایە/ بایەخ بە کەسێ/ شتێ دان؛ کەسێ/ شتێ بە لاوە گرینگ بوون ‹یەکجار لووتبەرز و بێفەڕە، لا لە باوکیشی ناکاتەوە!› ☰ به کسی/ چیزی اهمیت دادن

**لا کەوتن:** لا چوون ☰ کنار رفتن

**لا گرتن:** ۱. ئۆقرە/ ئارام گرتن ‹دا تاوێ لا بگرە! ئەپرووکی› ۲. پشتیوانی کردن؛ پشت گرتن ‹لەم کێشەدا من لای تۆ دەگرم› ۳. ئاگاداری کردن ‹لای منداڵەکە بگرە با نەڕوا› ☰ ۱. آرام گرفتن ۲. پُشتیبانی کردن ۳. مُراقبت کردن

**لا لێ بڕین:** لا لێ بڕینەوە؛ دەرەتان بۆ نەهێشتنەوە؛ قەتیس کردن ☰ در تگنا قرار دادن

**لا لێ بڕینەوە:** ☜ **لا لێبڕین**

**لا لێ سەندن:** لا لێ سەنن؛ ڕێگای هەڵاتن لێ گرتن؛ دەرەتان بۆ نەهێشتن ☰ راه فرار را سد کردن

**لا لێ سەنن:** ☜ **لا لێسەندن**

**لا لێ کردنەوە:** ۱. ئاوڕ وە سەر دانەوە؛ سەرنج دان ‹بە لایاندا دەڕۆن و لایەکیان لێ ناکەنەوە› ۲. پێڕاگەیشتن ‹لایەک لەو دایک و باوکە پیرەتان بکەنەوە!› ۳. بەشێکی گەورە بڕین لە شتێ ‹تا گەییشتم، لایەکی لێ کردەوە و بردی!› ☰ ۱. اعتنا کردن ۲. مُراقبت کردن ۳. بخشی از چیزی را بُریدن

**لاوە دان:** ۱. لادان؛ خستنە کەنارەوە ۲. دانەوە؛ کەندن؛ هەڵکەندن (زەوی) ☰ ۱. کنار زدن ۲. کندن (زمین)

**لاوە کردن:** لا کردنەوە؛ ئاوڕدانەوە ☰ واپس نگریستن

**وە لا خستن:** خستنە لا/ لاوە: ۱. دانە کەنارەوە ۲. لە سەر تەنیشت درێژ کردن ۳. کەمفرۆشی و تەرازوو سووکی کردن ٤. پاشەکەوت خستن ☰ ۱. کنار زدن ۲. بر پهلو خواباندن ۳. کم‌فروشی کردن ۴. پس‌انداز کردن

**وە لا دان:** دانە لاوە؛ خستە کەنارەوە ‹زولفت وە لا دە! ڕووت بنوێنە بە دەفعەیێ/ شەو ڕابرێ، ستارە نەمێنێ، قەمەر هەڵێ «سەیفولقوزات»› ☰ کنار زدن

**وە لا نان:** نانە لاوە؛ لا بردن؛ لە درێژە پێ دان یان ئەنجامی چالاکییەک ڕێگری کردن ‹توخوا ئەم جارە کە کۆ دەبنەوە/ چەرەز ومیوەی سەر مێزەکانیان هەموو وە لا نێن/ ئێسک و پرووسکی ئەنفالەکانیان لە بەردەم دانێن! «پەشێو»› ☰ کنار گذاشتن

**لا**[۲]: ئاوەڵناو. ۱. لاڕێ؛ نەساز و سەرسەخت ‹کابرایەکی لایە، قەت لە قسەی خۆی پاشگەز نابێتەوە› ۲. کەنار؛ دوورەپەرێز ‹من لەو کارانە لام، تکایە تێکەڵم مەکەن!› ۳. خوار؛ خێچ ‹من دەڵێم سەرێکی ئەم دیوارە لایە› ☰ ۱. لجباز و سرسخت ۲. کنارەگیر؛ مُنزوی ۳. کج؛ ناهموار

⊡ **لا بوون:** ۱. لاڕێ بوون؛ نەهاتنە سەر ڕێ؛ سەرسەخت بوون ۲. کەنارەگیر بوون؛ دوورەپەرێز بوون ☰ ۱. لجباز بودن ۲. کنارەگیر بودن

**لا**[۳]: ئامراز. لە لا؛ لە پەنا؛ لە پاڵ؛ لە کن؛ لە نزیک

یان لکاو بە شتێکەوە؛ لە لا ‹لای مـن؛ لای دیـوار›
☰ کنار

⊡ **بە لای شتێکدا نەڕۆیشتن:** قـەرەی شـتێک نەکەوتن؛ خۆ لە شتێک نەدان ‹ئەمانـە بـە لای جگەرەدا نەچی!› ☰ طرف چیزی نرفتن

**لا[4]**: ئامراز. ١. کن؛ نک؛ پاڵ؛ جەم ‹لای ئێوە خۆش› ٢. ئاوها؛ ئیتر؛ بەڵام ☰ ١. نزدِ ٢. اما

⊡ **لە لای:** لە پاڵ؛ لە کن؛ لجەم ‹لە لای تۆ خـار و خەس گوڵزارە بێ من/ لە لای من خەرمەنی گـوڵ خارە بێ تۆ «نالی»› ☰ پیشِ

**لا[5]**: دەنگ. وتـەی بانـگ کـردنی ژن لـە لایـەن مێردییەوە ‹لا! دا باوا› ☰ لفـظ خطـاب شـوهر بـه زنش

**لا ـ[6]**: پێشوشە. ١. پـاڵ ‹لاکـەل؛ لاشکاو› ٢. نیـوە ‹لاسـوور؛ لاسـووتاو› ٣. نێـوان ‹لاپـاڵ› ٤. کـەم ‹لاهێز› ٥. دوورە ‹لاشەر؛ لاجلـەو› ٦. لار ‹لارێ› ٧. غەیرە ‹لامژ› ٨. شوێن؛ جێگـا ‹لامێـردان› ٩. بێ؛ نا؛ نە ‹لادین؛ لامەزەو› ☰ ١. کنـاره؛ پهلـو ـ ٢. نیمه ـ ٣. میان ٤. کم؛ نا ـ ٥. ـ گریز ٦. کج ٧. غیـره؛ دیگر ٨. محل؛ سرا ٩. بی

**ـ لا[7]**: پاشەوشە. *[مەجاز]* لایـەن ‹لووتـەلا؛ کەلـەلا› ☰ طرف

**لا ـ[8]**: پێشگر. لە پێش چاوگێک دانیشێ، چـاوگێکی نوێ دروست دەکا ‹لاکردنەوە؛ لابردن› ☰ پـیش از مصدر قرار گیرد، مصدری تازه می‌سازد

**لا[9]**: سارستە. ئیتر با بەس بێ ‹تۆ خوا، سـەری خـۆت لا!› ☰ بس کُن

**لائیک** / la'îk/: ئاوەڵناو. لاییک؛ دژەدین ☰ لائیک

**لائـین** / la'în/: چـاوگ. دەمەلاسـکە کردنـەوە؛ لاسایی کردنەوە ☰ ادای کسی را درآوردن

**لابا[1]** / laba/: ناو. ١. لارەبا؛ بای لە لای ڕۆژهەڵات یان ڕۆژاواوە ٢. زبڵوزاڵێ کە لە بە بادا دانی خەلە خڕ بۆتەوە ☰ ١. باد شرقی یـا غربـی ٢. آت‌وآشـغال حاصل از باد دادن غله

⊡ **لابا کردن:** بە بادا کردنی خەلە بە بێژنگ ☰ باد دادن غلّه با غربال

**لابا[2]**: ئاوەڵناو. باپەنا؛ پەناگر ☰ بادنگیر

**لاباد** / labad/: ئاوەڵـناو. باگر؛ باپێچ؛ باگیر؛ بەربا ☰ بادگیر

**لابار[1]** / labar/: ناو. ١. تابار؛ نیوە بار ‹هەروا لابارێک هـەنار هەڵـڕژابوو› ٢. کـرێ بارەبـەر بـە نیـوەی بارەکەی ‹کەرەکەتم دەیە بە لابار خوێت بـۆ دێـنم› ☰ ١. لنگەبار ٢. کرایەی بار به نیمه (لنگه)ی آن

**لابار[2]**: ئاوەڵناو. ١. خوار و نارێک ‹ئەم کەلایە لابارە› ٢. *[مەجاز]* لاسار؛ کەللـەڕەق؛ گـوێنـەبیس ☰ ١. کج و ناهموار ٢. لجباز

**لاباری** / labarî/: ناو. ١. کاری کرێ بە نیوەبـار ٢. خـــوار و خێچـــی ٣. *[مـەجاز]* قێرســـچمەیی و سەرسەختی ☰ ١. کرایەی لنگـەبـاری ٢. کجـی و ناهمواری ٣. لجبازی

**لاباسک** / labask/: ناو. ١. نزیکەی دوند لە کەناری کێودا ٢. کاری پاڕانەوە و لالانەوە ☰ ١. ستیغ کوه ٢. عمل توسل جستن

**لاباشە** / labaşe/: نـاو. نانی سـاجی؛ نـانی تـەنکی سەر ساج ☰ نان ساجی

**لاباڵ** / labał/: ناو. کەناری باڵ ☰ کنارەی بال

**لابـان[1]** / laban/: چـاوگ. خاپـان؛ فریـو خـواردن؛ کڵاو چوونە سەر ☰ فریب خوردن

**لابـان[2]**: نـاو. فـێڵ؛ گـەڕ و گـزی؛ تەڵـەکەبازی ☰ نیرنگ

**لابانتە** / labante/: نـاو. بەرامـە؛ بـۆی خـۆش ☰ نکهت

**لابانـدن** / labandin/: چاوگ. خاپاندن؛ کڵاو سـەر نیان؛ فریو دان ☰ فریب دادن

**لابر** / labir/: ☜ **لابڕ**

**لابراو** / lab(i)raw/: ئاوەڵناو. پێچراوە؛ هەڵگیراو ☰

برچیده شده

**لابرک / labirk/**: ناو. بن‌باڵ؛ پووتەگا؛ کشتە ☰ تُهیگاه

**لابرێ¹ / labirê/**: ئاوەڵکار. لابنێ؛ لابەلێ؛ ئەو دەمی؛ ئەو کاتە ☰ آنگاه

**لابرێ²**: ئامراز. لابنێ؛ لابەلێ؛ بەڵام ☰ لیکن

**لابڕ¹ / labiř/**: ناو. لاوڕ؛ لابر: ١. کوچکە ئاورێ کە دیواری لە پێش نەبێ ٢. کاری دروونەوەی دەخڵ بە لادا ☰ ١. اجاقی که جلوش باز باشد ٢. عمل درو کردن به حالت مایل

**لابڕ²**: ئاوەڵناو. لاوڕ؛ لابر؛ سەربڕ؛ قەدبڕ؛ قەیبڕ؛ قەیبە؛ قەیبەبڕ؛ نێوانبڕ؛ نێوبڕ؛ ناوبڕ؛ ناقبڕ؛ نوابڕ؛ نزیکترین ڕێ بۆ گەیشتن ‹ڕێگەی لابڕ› ☰ میانبُر

◻ **لابڕ کردن**: سەربڕ کردن؛ نێوان بڕین ☰ میانبُر زدن

**لابڕدنگ / labiřding/**: ناو. زیپک؛ قسەی بە تێکوڵ ☰ متلک

**لابک / labik/**: ناو. تەڵە؛ داو ☰ دام؛ تله

**لابنێ / labinê/**: ☜ لابرێ

**لابووت / labût/**: ناو. لاوتە: ١. سەری ئاسنینی مەساسەی جووتێر ٢. ئاسنی پانی چەقاو بۆ قوڕی پێڵاو خاوێن کردنەوە ☰ ١. سر فلزی چوبدستی شُخم‌زن ٢. آهن پهنی که در زمین فرو می‌کنند و گل‌های کفش را با آن پاک می‌کنند

**لابە / labe/**: سارستە. لا؛ لاچۆ؛ بەسیکە ☰ بس کُن

**لابەر¹ / laber/**: ئاوەڵناو. ڕەوێنەر ‹پەرچەمی سوور و سپی و سەوزی ئەمە/ شادی‌هێنە، لابەری دەرد و خەمە «هێمن»› ☰ زُداینده

• **لابەر²**: پاشەوشە. ـ نەهێڵ؛ ـ ڕەوێن ‹خەم‌لابەر› ☰ ـ زُدا

**لابەرە / labere/**: ناو. بەرەی زین ☰ پیشبند زین

**لابەلا¹ / labela/**: ناو. لاوەلا: ١. قەدپاڵی کێو ٢. ئەم‌لا و ئەولا ‹لە لابەلاوە لەپڕ دەنگێ دێ/ ئەڵێ: کام گومان؟ کام بڕوا و ئایین؟ «گۆران»› ☰ ١. کمر کوه ٢. این سو و آن سو

**لابەلا²**: ئاوەڵناو. لاوەلا: ١. خوار و خێچ؛ لار و گێڕ ‹بۆچی ئەو تابلۆیە لابەلایە؟!› ٢. سەرسەخت؛ لاسار ‹کەسی وا پێچەقێن و لابەلام نەدیبووا› ٣. چین لە سەر چین ٤. نەگونجاو؛ نابەجێ ‹قسەی لابەلا› ٥. *[پلار]* خۆتێهەڵقوتێن ٦. تایبەتمەندی کەسێ کە لە نەخۆشی و ماندوویی یان سەرخۆشیدا خوارەوخوار دەڕوا ٧. خوارەکە و پێچەکە (بۆ ڕێگا) ‹ڕێگایەکی لابەلا و سەخڵەت› ٨. لاوەکی؛ ناسەرەکی؛ فەرعی سەر بە ئەم‌لاولا ‹بەشەی خۆی وەرگرتووە، ئەگەر بە کاری لابەلا نەیفەوتێنێ، بەشی دەکا› ☰ ١. کج و ناهموار ٢. لجباز ٣. چین‌چین ۴. نسنجیده ۵. فضول ۶. ویژگی کسی که تلوتلو راه می‌رود ٧. پرپیچ و خم ٨. غیر اصولی

**لابەلا³**: ئاوەڵکار. لاوەلا: ١. لار و گێڕ ‹بۆچی وا لابەلا بڕیوتە؟!› ٢. ڕاست بە باری ئاسۆییدا ‹زولفیان لابەلا دەکەن بە لادا/ ڕۆژ هەوری لە سەر ڕووی خۆی وە لا دا «سەیفولقوزات»› ☰ ١. کج و مُعوج ٢. مستقیم در جهت افقی

**لابەلایی / labelayî/**: ناو. لاوەلایی: ١. فزوولی؛ دۆخی خۆتێهەڵقوتاندن ٢. لاساری؛ سەرسەختی ٣. خواری و پێچەڵپێچی (ڕێگە و...) ☰ ١. فضولی ٢. لجبازی ٣. پیچ و خم (راه و...)

**لابەلێ / labelê/**: ☜ لابرێ

**لابی / labî/**: ناو. ١. سەرسەرا (بەتایبەت هی هوتێل) ٢. *[رامیاری]* تاقمی هاوپەیمان کە بە کارێکەوە خەریکن ☰ ١و٢. لابی

**لابیتە / labîte/**: ناو. لاپیتە؛ لاویتە: ١. مەساسە؛ مەساسک؛ داردەستی جووتیار لە شوو بڕیندا کە سەرێکی کلکەبزمار و سەرێکی پیشکانە ٢. پیشکانی گیاکەنی ☰ ١. چوبدست شخم‌زن ٢.

بیلچەی گیاکنی

**لابێر** / labêr/: ناو. پارمەتیدەری بێری بۆ دوور کردنەوەی بەرخەل لە مەڕ و بزن، کاتی دۆشین ☰ کمکِ شیر دوش

⊡ **لابێر کردن** جیا کردنەوەی بەرخ لە مەڕ ☰ جدا کردن برّه از گوسفند

**لاپا** / lapa/: ناو. ١. ☜ **لاپاڵ** -١ ٢. چۆنیەتی وەرگەڕان و باو خواردنی پێ ☰ ١. ☜ **لاپاڵ** -١ ٢. سکندری

⊡ **لاپا کردن** لاپێ بوون؛ لاق وەرگەڕان ☰ پیچ خوردن پا

**لاپار** / lapar/: ناو. ١. ☜ **لاپاڵ** -١ ٢. سەرەوژوورەی ڕژد ٣. سواپ؛ بەردی تەنک و لووسی گوێ چەم ☰ ١. ☜ **لاپاڵ** -١ ٢. سربالایی تُند ٣. شن صاف و نازک کنار رودخانه

**لاپاران** / laparan/: ☜ **لاپارێن**

**لاپارێن** / laparên/: ناو. لاپاران؛ سواپێن؛ جۆرێ کایەی بە زیخ ☰ نوعی شن‌بازی

**لاپاڵ** / lapał/: ناو. ١. لاپا؛ لاپار؛ قەدپاڵی کێو ‹بەهار بوو دیسان خەملی وەک بەهەشت/ مێرگ و لاپاڵ و بەندەن و پێدەشت «هێمن»› ٢. پاڵ؛ لا؛ تەنشت ‹بێ لە لاپاڵمەوە دانیشە!› ☰ ١. کمرکش کوه ٢. پهلو؛ نزد

**لاپاڵو** / lapałû/: ☜ **لاقەبرغە**

**لاپان** / lapan/: ناوەڵناو. خڕیلەی نە تەواو خڕ ☰ کُروی ناقص

**لاپانک** / lapanik/: ناو. بن سووچی ڕەشماڵی هەڵدراو ‹فلان بیوەژن لە لاپانکی فلان ماڵدایە› ☰ گوشەی برچیدەی سیاه‌چادر

**لاپاو** / lapaw/: ☜ **لافاو**

**لاپچین** / lapçîn/: ناو. پووتین؛ پۆتین؛ چزمە؛ جزمە؛ پۆستاڵ؛ پێڵاوی تا قولەقاپە ☰ پوتین

**لاپرە** / lap(i)re/: ناوەڵناو. لاپۆرە؛ کەس‌نەناس ☰ ناشناس

**لاپرەسەن** / lap(i)resen/: ناوەڵناو. لاپرەسەنگ؛ لاپلەرسەنگ: ١. لاپرە؛ کەس‌نەناس ‹ڕاستت دەوێ هەر کەس، هەر تیرە، هەر کۆمەڵ، ئاوەها بێ چەقە و گێچەڵ وەکوو کیسەڵ لە ناو قاپێکی قەپاتدا بێ‌خەم بژی و بیر و مژی بە گاڵە و هەرا تاڵ نەکا و سەری بە پرس و پەرسفی لاپرەسەن و دژەبڕوایان قاڵ نەکا، هێند ڕەحەت و ئاسوودەیە دەبێ ئیرەیی پێ بەری و بێژی: ئای خۆزگە بە خۆی کات ... «هەژار، *چوار ناملکە*»› ٢. فزوول؛ خۆتێ‌هەڵقولتێن ☰ ١. ناشناس ٢. فضول

**لاپرەسەنگ** / lap(i)reseng/: ☜ **لاپرەسەن**

**لاپک** / lapik/: ناو. لەپک؛ لەپیک؛ لەپێک؛ دەسکێش ☰ دستکش

**لاپلا** / lap(i)la/: ناو. لابەلا؛ ڕێگەی پڕ قەمچ و پێچ ☰ راه پرپیچ و خم

**لاپلار**[1] / lap(i)lar/: ناو. قسەی بە تێکوڵ ☰ متلک

**لاپلار**[2]: ناوەڵناو. لاپواز؛ خۆتێ‌هەڵقولتێنی سەربەخۆ ‹شەوێک دادێ ببمە میوانی لاپلار و بانگ‌نەکراوی ماڵەکەتان! «شێرکۆ»› ☰ ناخواندەی فضول

**لاپلەرسەنگ** / lap(i)lerseng/: ☜ **لاپرەسەن**

**لاپواز**[1] / lap(i)waz/: ناو. پوازێکی بچووکە لەو سەری قەڵشاوی دار دەخرێ ☰ پغاز جانبی

**لاپواز**[2]: ☜ **لاپلار**[2]

**لاپۆشک** / lapuşk/: ناو. چنگاڵ؛ چنگوڕک ☰ چنگال حیوان درنده و پرندەی شکاری

**لاپۆتی** / lapotî/: ناوەڵناو. ڕەجاڵە؛ ڕووتەوپووتە ☰ رجاله

**لاپۆرە** / lapore/: ☜ **لاپرە**

**لاپۆلی** / lapolî/: ناوەڵناو. کورتەبالای گۆشتن ☰ کوتاەقد چاق

**لاپوور** / lapûr/: ناو. لاشەی گەنیو ☰ لاشەی

مُتعفن

**لاپووله** / lapûle/: ناو. پلپلـه؛ پپلـه؛ زێڕەسـکەی ورد لە زنجیردا بۆ خشڵ ☰ زیور آویزه

**لاپە** / lape/: ☜ **لەپە^۱ـ۱**

**لاپەڕ^۱** / lapeř/: ناو. لاپـەل؛ لاپەلـە : ۱. شـوێنی کەنار لە دەشت و لەوەڕگەدا ‹لاپەڕ و بـزۆێنخـڕ و جێـی مانـەوە/ بـۆ لـەوەڕ و خـەوتن و بووژانـەوە «حـەقیقی»› ۲. چەرمێ کە بۆ کالە دەبـڕدرێ ۳. ڕووپەڕی کتێب ٤. لاپەڕە؛ نیوتەبەقی کاغەز ☰ ۱. جای پرت در چراگاه ۲. چرم چارُق ۳. صفحەی کتاب ۴. یک ورق کاغذ

⊡ **لاپەڕ هەڵدانەوە:** ☜ **لاپەڕە وەرگێڕان**

**لاپەڕ^۲**: ئاوەڵناو. لاپەل؛ لاپەلە : ۱. تاک و دوور لـە ئاوایی ‹جێگەی تۆ لە دێی چۆڵ و لاپـەڕە/ کۆمەڵـی دوورن وەک بزن و مـەڕە «مـوفتی پێنجـوێنی»› ۲. تەریک؛ ئارام؛ بێ دەنـگ و قـاڵ ۳. دوورەپـەرێز؛ کەنارەگیر ☰ ۱. پرت؛ تک‌افتاده ۲. دنج ۳. مُنزوی

**لاپـەڕە** / lapeře/: نـاو. ۱. هــەرکام لــە دوو لای پەڕەیەک ‹لاپەڕەی ژینم هەموو هەڵدەیتەوە، تێیـدا نییە/ باسی فرمێسـک و هەناسـە و شـیوەن و ماتـەم نەبێ «هێمن»› ۲. لاپەڕ؛ نیوتەبـەقی کاغـەز ☰ ۱. صفحەی کتاب ۲. یک ورق کاغذ

⊡ **لاپـەڕە وەرگێـڕان:** لاپــەڕ هەڵــدانەوە؛ لاپــەڕە هەڵگێڕانەوە: ۱. ڕووپـەڕ هەڵـدانەوە (کتێـب و دەفتەر و ...) ۲. *[کینایە]* گۆڕینی باس و خـواس لە سەر مەبەستێ ☰ ۱. ورق زدن (کتاب و دفتر و ...) ۲. بحث را عوض کردن

**لاپەڕە هەڵگێڕانەوە:** ☜ **لاپەڕە وەرگێڕان**

**لاپەل** / lapel/: ☜ **لاپەڕ**

**لاپەلە** / lapele/: ☜ **لاپەڕ**

**لاپـەنا** / lapena/: ناو. هێڵـی ئەسـتوونی قـەراخ کێڵگە ☰ شیارهای عمودی شخم در اطراف مزرعه

**لاپیتـە** / lapîte/: نـاو. ۱. پلاکــارت؛ وەرەقێکـی پێوەنووســراوی بــە ســەر دارەوە کــراو، لــە خۆپیشـاندانەدا بـە دەسـتییەوە دەگـرن ۲. ☜

**لابیتە** ☰ ۱. پلاکارد ۲. ☜ **لابیتە**

**لاپێ** / lapê/: نـاو. کـوێرەڕای سـەخت ☰ کورەراه دشوار

⊡ **لاپێ بوون:** ☜ **لاپا کردن**

**لاپێڕ** / lapêř/: ☜ **لاتیڕ**

**لاپێژ** / lapêj/: ناو. تەپالەپێژی بـە هـەق یـان بـە نیوەیی ☰ تاپالەکار کارمُزدی

**لات^۱** / lat/: ناو. ۱. تات؛ لاتەبەرد؛ بەردی تەخت و پان و لـووس ۲. زەوی خـەتدراو بـۆ کـێڵان ۳. شاخ؛ بەردی گەورە لـە چیـادا ☰ ۱. تختـەسـنگ صاف ۲. زمین شیار شدەبرای شُخم ۳. صخره

**لات^۲**: ئاوەڵناو. ۱. نەدار و فەقیر ۲. حاڵ‌پەریشـان ۳. شەڕفرۆش ☰ ۱. فقیر ۲. پریشان‌حال ۳. لات

⊡ **لات بوون:** ۱. پەریشـانحـاڵ بـوون ۲. فـەقیر بوون ۳. لەڕ بوونەوە ☰ ۱. پریشان‌احوال شدن ۲. فقیر شدن ۳. لاغر شدن

**لات کەوتن:** بێحاڵ‌وباڵ بوون و تەواو دامـان ☰ بینوا شدن و درماندن

**لاتار** / latar/: ناو. لاتەری: ۱. تاوێرەبەرد؛ بـەردێ کە لە کێو گلار دەبێتەوە ۲. دوو داری درێژی لە قیسپ ئەستوورتر لە قیسپەعەڕابە قـایم دەکـرێ ☰ ۱. سنگ غلتان از کـوه ۲. دو چـوب بلنـد شاسـی گاری

**لاتاری** / latarî/: نـاو. قورعەکێشی؛ هایبـەخت ☰ قُرعەکشی

**لاتانـە^۱** / latane/: ئاوەڵـناو. بـێئاکارانـە ‹قسـەی لاتانە› ☰ مُبتذل

**لاتانە^۲**: ئاوەڵکار. بێئاکارانە ‹لاتانە قسە مەکـە!› ☰ بی‌ادبانه

**لاتاو** / lataw/: نـاو. زیپک؛ لابـڕدنگ؛ قسـەی بـە تێکوڵ ☰ متلک؛ طعنه

**لاتایەن** / latayen/: ناو. لادایەن؛ ژنێ کە کۆمەکی دایەن دەکا لە کاری مامانیدا ☰ دستیار ماما

**لاتخانـە** / latxane/: نـاو. ١. تەمـەڵخانـە ٢. فەقیرخانە ٣. شوێنی کۆ بوونەوەی لات‌ولووت ☰ ١. تنبل‌خانە ٢. نوانخانە ٣. لاتخانە

**لاتر** / latir/: ناو. ئامرازێکی قومارە دەیسوورێنن خۆت و بەختت ☰ لاتاری

**لاتراسکە** / lat(i)raske/: ☜ **لاترووسکە**

**لاترووسـکە** / lat(i)rûske/: نـاو. لاتراسـکە؛ لاتریسکە: ١. کار و ڕەوتی تل خواردن ٢. کاری لا دانی بارەبەر لە ڕێگە بۆ لـەوەڕ ☰ ١. عمـل تلـو خوردن ٢. عمل راه کج کردن باربر برای چریدن

**لاترە** / lat(i)re/: ناو. ڕەت؛ لەتر؛ تل ☰ تلو

◘ **لاترە بردن:** ڕەت بـردن؛ لـەتر دان؛ بـەولاولادا کەوتن ☰ تلو خوردن

**لاترە بەستن:** ڕەت بردن و دوور کەوتنـەوە (بـە هـۆی شـەکەتی یـان خـەو هـاتن) ‹بـینی لاتـرە دەبەستێ، وتی: وەرە سواری ئەسپەکەت بکەم› ☰ تلو خوردن و دور افتادن (از خستگی یا بی‌خوابی)

**لاتریسکە** / lat(i)rîske/: ☜ **لاترووسکە**

**لاترقـەوچ** / latiřqewç/: ناوەڵـناو. لاترقەوچـە؛ لاترقەوچەڵفاچ: ١. تیلاوتیل ٢. خواروخێچ ☰ ١. أریب ٢. کج‌وکوله

**لاترقەوچە** / latiřqewçe/: ☜ **لاترقەوچ**

**لاترقەوچـەڵفـاچ** / latiřqewçełfaç/: ☜ **لاترقەوچ**

**لاتفرۆشی** / latf(i)roşî/: نـاو. *[مـەجاز]* شەڕفرۆشـی ☰ شارلاتانی

**لاتـک** / latik/: نـاو. پارچـەزەوی پچـووک ☰ قطعەزمین کوچک

**لات‌وشەلات** / lat û şelat/: ☜ **لات‌ولوت**

**لات‌ولـوت** / lat û lût/: لات‌ولـەوا؛ لات‌وشـەلات؛ عەلۆجەلۆ؛ ڕەجالە و ڕووتە و پووتە ☰ لات‌ولوت

**لات‌ولەوا** / lat û lewa/: ☜ **لات‌ولوت**

**لاتە** / late/: نـاو. ١. تەنگەنەفەسی ٢. جۆرێ جبە ☰ ١. نفس تنگی ٢. نوعی بالاپوش

◘ **لاتـە بـوون/ کـردن:** تەنگەنەفـەس بـوون؛ تەنگەنەفەسـی گـرتن (دەسـتەواژەیەکە کـاتی تووڕەیی و بێزاری دەگوترێ) ‹ئەوە لاتەتـە؟ بـۆ وا دەکەی؟؛ ئەی یاخوا لاتە کەی بۆ کـاری کـردت!› ☰ اصطلاحی در بیان بیزاری و خشم

**لاتەبەرد** / lateberd/: ☜ **لات**[1]**ـ١**

**لاتەبەق** / latebeq/: ناو. لاتەوەق؛ پەڕە کاغـەز ☰ نیم ورق کاغذ

**لاتەرافە** / laterafe/: ناو. پاڵووف؛ پاڵوو؛ لاتـەڕاف؛ خالیگە ☰ پهلو

**لاتەری**[1] / laterî/: ☜ **لاتار**

**لاتەری**[2]: ناوەڵکار. گۆترە ☰ الکی

**لاتـەریک** / laterîk/: ناوەڵـناو. دوورەپـەرێز ‹لـە هەڵوێستدا لاتەریک و لە دەسـکەوتدا شـەریک!› ☰ کنارەگیر

**لاتەڕاد** / lateřad/: ناو. تەڕاد؛ لاتـەڕیزە؛ پێسـت و گۆشتی نێوان ڕان و زگ لە تەنیشتەوە ☰ تُهیگـاه میان ران و شکم

**لاتەڕاف** / lateřaf/: ناو. لاتەڕافە؛ گۆشتی خاڵـیگە ☰ گوشت تُهیگاه

**لاتەڕافە** / lateřafe/: ☜ **لاتەڕاف**

**لاتەڕیزە** / lateřîze/: ☜ **لاتەڕاد**

**لاتەک** / latek/: ☜ **لاتەنیشت**

**لاتەنشت** / latenişt/: ☜ **لاتەنیشت**

**لاتەنیشـت** / latenîşt/: نـاو. لاتەنشـت؛ لاتـەک ‹گولەکە لە لاتەنیشتییەوە دەرچووە› ☰ پهلو؛ کنار

**لاتەوەق** / lateweq/: ☜ **لاتەبەق**

**لاتـی** / latî/: نـاو. ١. لاتـەوازی؛ بەلـەنگازی ٢. شـەلاتی؛ شەڕفرۆشی ☰ ١. بینوایی ٢. شارلاتانی

**لاتیر** / latîr/: ☜ **لاتیڕ**

**لاتیڕ** / latîř/: ناو. لاتیر؛ لاتیل؛ لاچیر؛ لاپێر؛ تماشا بە گۆشەی چاو ‹بە لاتیرێکەو تەماشای کردم!› ☰ چشم‌غُرّە

⊡ **لاتیڕ لێ کردنەوە/ بردنەوە:** بە تووڕەییەوە لێ ڕوانین ☰ چشم‌غُرّە رفتن

**لاتیگەری** / latîgerî/: ناو. بەرهەڵدایی و شەڕفرۆشی ☰ لات‌بازی

**لاتیل** / latîl/: ناو. ١. ☜ **لاتیڕ** ٢. کاری بڕینی قیچەڵفاچ ☰ ١. ☜ **لاتیڕ** ٢. برش أُریب

⊡ **لاتیل کردن:** گەنم بە دەم بادا دان بە لێواری بێژنگ ☰ غلّە به باد دادن با لبەی غربال

**لاتیلاگ** / latîlag/: ناو. گۆشەی کەللەی سەر ‹کلاوێکی بە لاتیلاگی سەریەوە نابوو› ☰ طرفی از کله

**لاتین** / latîn/: ☜ **لاتینی**

**لاتینی** / latînî/: ناو. لاتین: ١. گرنگ‌ترین زمان لە لقی ئیتالیک، لە زوانگەلی هێندوو- ئوروپایی، زمانی زانستی و فەرهەنگی ئورووپای ڕۆژاوا تا برانەوەی چەرخی حەڤدەی زایینی ٢. لقێکی گەورە و گرینگ لە زمانگەلی ئورووپایی ئەوڕۆ بریتی لە: فەڕانسەوی، ئیتالیایی، سپانیۆل، پورتغالی و... ☰ ١و٢. لاتینی

**لاتیە** / lat(i)ye/: ناو. لاتێ؛ کلاوی پەستواو لە خوری ☰ کُلاه پشمی

**لاتێ** / latê/: ☜ **لاتیە**

**لاتێڕ** / latêř/: ناو. بەشێ لە دوو بەشی جەوالی دووتایی ☰ لنگەی جوال دوتایی

**لاتێکس** / latêks/: ناو. شیرەک؛ شیلە؛ شیلاوگە؛ شیلاوە؛ جۆرێک جەوی ناو لاسک و میوەی برێ دار و ڕوەک کە وەک چەسپ وایە و دەسکێشی برینکاری و زۆر شتی تری لێ دروست دەکەن ☰ لاتِکس

**لاج**[1] / lac/: ناو. تەنیشت؛ لا (بۆ هێلکەی دەڵێن) ☰ کنار (مربوط به تخم‌مرغ)

**لاج**[2]: ئاوەڵناو. لاز؛ لاس؛ کوڕەجحێڵەی شۆخ و جوان ☰ جوان زیباروی

**لاجامە** / lacame/: ناو. ١. داری کەنارەی عارەبە ٢. دیوارۆکەی بەرهەیوان ٣. تیغەی نێوان ژوور لە دار ٤. داری ئەو لاولای لاشیپانە ٥. وێنەی لە تەنشتەوە ☰ ١. نردەی پهلوی گاری کشاورزی ٢. نردەی تراس ٣. تیغەی چوبین بین دو اتاق ۴. دو چوب عمودی چهارچوبِ در ۵. عکس نیمرخ

**لاجانگ** / lacang/: ناو. بناژانگ؛ نێوان ڕوومەت و ئەستۆ ‹لاجانگت وەکوو گزنگی تاوێ/ هەر بۆ خۆی جوانە، تیف‌تیفەی ناوێ «هێمن»› ☰ عارض؛ عُذار

**لاجک** / lacik/: ☜ **لاوژۆکە ـ١**

**لاجڵەو** / lac(i)łew/: ئاوەڵناو. تەعلیم‌نەدیتووی سەرڕەق ‹تیفلی دڵ هەرزەگەرد و لایەشعەر/ ئاسمان ئەسپی لاجڵەو دێنێ «سالم»› ☰ بدلگام

**لاجوەرد** / lac(i)werd/: ناو. لاجیوەرد: ١. ماکێکی شینی تۆخە کە لە شیلەی گیا یان بە شێوەی کیمیایی بەرهەم دێت ٢. ماکێکی شین کە لە سوانی بەردی لاجوەرد و پرتووکانی کانییەکانی دروست دەبێ ☰ ١و٢. لاجورد

**لاجوەردی** / lac(i)werdî/: ئاوەڵناو. لاجیوەردی؛ ڕەنگی کەوەی ئاسمانی ☰ لاجوردی

**لاجە** / lace/: ئاوەڵناو. پەنابەر ☰ پناهنده

**لاجەک** / lacek/: ☜ **لاوژۆکە ـ١**

**لاجیوەرد** / lacîwerd/: ☜ **لاجوەرد**

**لاجیوەردی** / lacîwerdî/: ☜ **لاجوەردی**

**لاچار** / laçar/: ئاوەڵناو. داڵگۆشت؛ لەڕ و لاواز ☰ لاجون

**لاچاو** / laçaw/: ناو. گۆشەی چاو؛ تیلی چاو ☰ گوشەی چشم

**لاچاوە** / laçawe/: ناو. دوو باریکەقایشی بەندکەری سەر کەللە و ڕەشمەی هۆسار ☰ دو

قطعه چرمی از ابزار دهنه و افسار که در طرفین صورت اسب قرار می گیرند

**لاچک / laçik/**: ناو. ۱. ☜ **لاسک**[1]**ـ۲** ۲. لەتکە هەرمێ ۳. ☜ **لەچک** ☰ ۱. ☜ **لاسک**[1]**ـ۲** ۲. برگەی گُلابی ۳. ☜ **لەچک**

**لاچلاچ / laçlaç/**: ☜ **لاچلاچک**

**لاچلاچک / laçlaçik/**: ناو. لاچلاچ؛ شەویلە؛ شەویلکە؛ شەویلاک ☰ آرواره

**لاچناکە / laç(i)nake/**: ☜ **لاچناگە**

**لاچناگە / laç(i)nage/**: ناو. لاچناکە؛ لاچەنە؛ بەشی سەرووی شەویلە ☰ قسمت بالایی آرواره

**لاچۆ / laço/**: سارستە. لا؛ لابە؛ بەسی‌کە ☰ بس کُن

**لاچۆپاچۆ / laçopaço/**: ناو. خرکەوپرکە؛ شرەوبرە ☰ خرت‌وپرت

**لاچەژ / laçej/**: ناو. مرەبا؛ میوەی لە شەکردا کولاوی خەست هەڵگەڕاو ☰ مُربا

**لاچەنە / laçene/**: ناو. ۱. ☜ **لاچناگە** ۲. قایشی سەر کەللەی لغاو کە بە سەر شەویلەدا دەچێ ☰ ۱. ☜ **لاچناگە** ۲. نوار چرمی لگام کە بر آرواره می‌گذرد

**لاچیڕ / laçîř/**: ☜ **لاتیڕ**

**لاچین / laçîn/**: ناو. ۱. کاڵەی چەرمین ۲. سەقر؛ باڵدارێکی ڕاوکەرە، لە باز پچووکتر ☰ ۱. پاتابە؛ چارُق ۲. چغر؛ از پرندگان شکاری

**لاحیدە / laĥîde/**: ئاوەڵناو. عەلاحیدە؛ تایبەتی ☰ ویژه

**لاخ / lax/**: ناو. گیای بە دەس دووراوی کۆوە نەکراوی نەبەستراو ☰ گیاه درو شده‌ی دسته نشده

⊡ **لاخ کرن**: ۱. دروونەوەی گیا و دەخڵ ۲. بەسەر یەکدا کردنی دەغل و گیای دووراو ۳. خاوێن کردنەوەی چەکی شەڕ ☰ ۱. بسته‌بندی کردن دروشده ۲. بر هم انباشتن بسته‌های دروشده ۳. پاک کردن اسلحه

**لاخاڵی / laxałî/**: ئاوەڵناو. تەنیشت‌والا ☰ پهلوتُهی

**لاخاڵیگە / laxałîge/**: ☜ **لاقەبڕغە**

**لاخڕ / laxiř/**: ناو. لالێژی لایەنێکی دۆڵ «بەهار هات و دەخەملێ کێو و دەشت و بەندەن و لاخڕ «هێمن»» ☰ شیب یک طرف درّه

**لاخوار / lax(i)war/**: ناو. ۱. ☜ **لاسەنگ**[1]**ـ۱** ۲. لاخواروو؛ ژێروو؛ لای خوار ☰ ۱. ☜ **لاسەنگ**[1]**ـ۱** ۲. طرف پایین

**لاخوارگ / lax(i)warig/**: ☜ **لاخواروو**

**لاخوارنگ / lax(i)waring/**: ☜ **لاخواروو**

**لاخواروو / lax(i)warû/**: ناو. لاخوارگ؛ لاخوارنگ؛ ژێروو ☰ طرف پایین

**لاخوراو / laxuraw/**: ئاوەڵناو. کەنارەساو ☰ پهلوساییده

**لاخوزە / laxuze/**: ئاوەڵناو. لاقوزە؛ لاقوپاوی نەرم و تاڵ (گرکە) ☰ یک طرف نرم و تورفته (گرمک)

**لاخوەر / lax(i)wer/**: ناو. بەربەرۆچکە؛ بەربەرۆچک؛ شوێنی خۆرگیر ☰ جای آفتابگیر

**لاخۆر / laxor/**: ئاوەڵناو. ۱. تایبەتمەندی حەیوانێ کە لە ئاخوڕی حەیوانی تەنیشتی دزی دەکا ۲. *[کنایە، پلار]* لاکوت؛ مشەخۆر؛ چەورە و ماڵانگەڕ ☰ ۱. ویژگی دامی کە از آخور پهلویی بچرد ۲. مُفت‌خور

**لاخە / laxe/**: ناو. لاس؛ لاخ؛ گیای درواوی نەبەستراوی کۆم‌نەکراو ☰ گیاه درویده‌ی جمع نشده

**لاخێز / laxêz/**: ناو. ۱. ☜ **لافاو** ۲. ئاخێز ☰ ۱. ☜ **لافاو** ۲. نیم‌خیز

**لاد / lad/**: ناو. کات؛ دەم «تۆ هەر سات شادیت بێ‌ئەندازە بۆ/ من هەر لاد پەرێم دەردێ تازە بۆ «مەولەوی»» ☰ لحظه؛ دم

**لادار**[1] **/ ladar/**: ناو. ۱. ئالووداری خانوو ۲. چەلاکی قەراغ ڕەشماڵ ۳. دوو داری درێژی چوارچێوەی دار تەون ☰ ۱. الوار سقف ۲. ستونک

کنارەی چادر ۳. دو چوب کنارەی دستگاه بافندگی

**لادار**[۲]: ☜ **لایەنگر**

**لاداری** / ladarî/: ☜ **لاکۆشکە**

**لادان** / ladan/: ناو. تاقەی گوشاد ☰ تاقچەی گُشاد

**لاداوێن** / ladawên/: ناو. شاقەل؛ چاکەڵ ☰ حاشیەی دامن

**لادایەن** / ladayen/: ☜ **لاتایەن**

**لادرگا** / ladirga/: ☜ **لادەری**

**لادڕ** / ladiř/: ☜ **لادڕگە**

**لادڕگە** / ladiřge/: ناو. لادڕ؛ بوودڕ؛ ڕەهۆڵ ☰ شکاف در سنگ و کوه

**لادز** / ladiz/: ناوەڵناو. ۱. دەسکیس؛ شەریکی دز و هەواڵی کاروان ۲. دزی خوێرپلە و سیرمەخۆر ☰ ۱. شریک دُزد و رفیق قافله ۲. دلەدُزد

**لادە** / lade/: ناو. تەپاڵەی لە سەر یەک دانراوی قووچەکراو ☰ تاپالەی انباشته

**لادەر**[۱] / lader/: ناوەڵناو. لە ڕێ دەرچوو ☰ مُنحرف

**لادەر**[۲]: پاشەوشە. ـ پارێز ‹خۆلادەر› ☰ پرهیز

**لادەری** / laderî/: ناو. لادرگا؛ لەتە درگای دووکان کە لە چوار- پێنج پارچە پێک‌هاتبێ ☰ لنگەدر چند قطعەای مُغازه

**لادەس** / lades/: ☜ **لادەست**

**لادەست**[۱] / ladest/: ناوەڵناو. لادەس؛ نزیک ئەوەندەی دەست بیگاتێ ☰ در دسترس

**لادەست**[۲]: جێناو. لادەس؛ ئەو کەسە لە پەناوەیە ‹ئەوە لادەستەکەت چ دەڵێ؟› ☰ کناری

**لادەستی** / ladestî/: ناو. پەنجەکێش؛ جۆرێ کولێرە ☰ نوعی گردەی نان

**لادەگا** / ladega/: ناو. ۱. ☜ **لادێ**[۱] ۲. جێی سانەوە ☰ ۱. ☜ **لادێ**[۱] ۲. استراحتگاه

**لادیڤ** / ladîv/: ☜ **لادێیی**

**لادین** / ladîn/: ☜ **لامەزەب**

**لادینی** / ladînî/: ناو. بێ‌خودایی؛ بێ‌دینی ☰ بی‌دینی

**لادێ**[۱] / ladê/: ناو. لادەگا؛ لاگا؛ لاگە؛ دێ؛ دێهات ‹دێم بەرەو هۆبە و هەواری باسەفا/ دێم بەرەو لادێ بەرەو کانگای وەفا «هێمن»› ☰ روستا

**لادێ**[۲]: ناوەڵکار. لادێو؛ ساتێ؛ تاوێ ☰ دمی

**لادێو** / ladêw/: ناوەڵکار. لادێ؛ تاوێ ‹کزەی جەرگ وێم مەژنەوون بە گۆش/ دڵ لادێو جە خەم نییەن فەرامۆش «بێسارانی»› ☰ دَمی؛ لحظەای

**لادێیی** / ladêyî/: ناوەڵناو. لادیڤ؛ لاگایی؛ لاگەیی؛ لاگیەیی؛ گوندی؛ خەڵکی دێهات ‹دیم کچێکی لەباری لادێیی/ بۆ نوێژ ڕادەخا بەرەڵبێنێ «هێمن»› ☰ روستایی

**لار**[۱] / lar/: ناو. ۱. لەش؛ بەدەن؛ گش ئەندام ۲. جۆرێ تفەنگی ڕاو ۳. پشتێری گا و گوێل ٤. جۆبرکە؛ ملە ☰ ۱. تن ۲. نوعی تفنگ شکاری ۳. طویلەی گاو و گوساله ۴. آبدُزدک

**لار**[۲]: ناوەڵناو. ۱. خوار؛ چەوت؛ چەوێل ۲. کز؛ داڵگۆشت ۳. [کینایە] جەڵەب؛ بەدجنس ☰ ۱. کج ۲. لاغر ۳. بدقلق

⊡ **لار بون:** ۱. خوار بوون ۲. داهاتن ☰ ۱. کج شدن ۲. خمیدن

**لار بونەوە:** ☜ **لارەوە بون**

**لار کردن/ کردنەوە:** لارەو کردن؛ لارەوە کردن: ۱. چەماندن ۲. خوار کردن ☰ ۱. خم کردن ۲. کج کردن

**لارەو بون:** ☜ **لارەوە بون**

**لارەو کردن:** ☜ **لار کردنەوە**

**لارەوە بون:** لار بوونەوە؛ لارەو بوون: ۱. داهاتن؛ چەمانەوە ۲. [کینایە] گیان دەرچوون ☰ ۱. خمیدن ۲. مُردن

**لارەوە کردن:** ☜ **لار کردنەوە**

▪ **لار**[۳]: پاشەوشە. خوار؛ لابەلا ‹شەدەلار؛ دەملار› ☰ ـ کج

**لار**[4]: پێرۆ. ← **لەنجەولار/ لەش‌ولار**

**لار**[5]: لێل. ← **لارولەنجە**

**لاراو / laraw/**: ئاوەڵناو. دژاو؛ تایبەتمەندی زەوینی لێژ کە ئاوی پێوە گیر نابێ ▬ ویژگی زمین شیبداری که آب را به خود نمی‌گیرد

**لارج / larc/**: ئاوەڵناو. لارژ: ١. *[مەجاز]* دەستندە؛ دەس‌بڵاو ‹مرۆی لارج› ٢. گەورە؛ زل (جل‌وبەرگ) ‹کراسی لارج› ▬ ١و٢. لارژ

**لارژ / larj/**: ☜ **لارج**

**لارک / larik/**: ناو. لا؛ تەنشت؛ تەک ▬ پهلو؛ کنار

**لارنژیت / larinjît/**: ناو. خرزەک؛ قوڕباجە؛ کەلەشێرە ▬ لارنژیت

**لاروا / larwa/**: ناو. ١. لابەلا؛ کاری خوارەوخوار ڕۆیشتن ٢. کۆمەڵی کڕیاران ▬ ١. عمل تلو خوردن ٢. گروه خریداران

**لاروا ـ لاروا / larwa larwa/**: ناو/ ئاوەڵکار. تلاوتل؛ کاری خوارەوخوار ڕۆیشتن ▬ حالت تلو ـ تلو خوردن

**لاروایی / larwayî/**: ناو. لارەوای؛ کاری کڕینی شتێ لە لایەن چەند کەسێکەوە ▬ خرید مشترک

**لاروگێر / lar û gêř/**: ئاوەڵناو. خواروخێچ ▬ کج و مُعوج

**لارولەنج / lar û lenc/**: ☜ **لارولەنجە**

**لارولەنجە / lar û lence/**: ناو. لارولەنج؛ کاری ڕۆیشتنی بە ناز ‹بەژن‌وبالاکەت نموونەی هەیکەلی یۆنانییە/ لارولەنجەت مۆسیقایە، بەستەیە، گۆرانییە «هەردی»› ▬ خرام

**لارە**[1] **/ lare/**: ناو. ١. گریانی توندی زارۆ ٢. ئامووری یەکپارچە کە دەندەش لە خۆیەتی ٣. دەنکێکە لە ناو گەنم دەڕوێ ٤. کاری ڕۆیشتنی بە ناز ‹لارەی قەتارەی لاو شەدەلاران/ کەم‌کەم ئیشارەی پەنجە وشاران «مەولەوی»› ٥. ڕەوتی بزووتنەوەی گیا و لکەداری ناسک لە بەر با ٦. مێروویەکی بچووکی ئاوژییە ٧. جۆرێ گەنم ٨. ڕەوتی خوارەو بوون بە لای تەنشتا ٩. هێڵی چەفت؛ خەتی لار و خوار لە کێڵاندا ▬ ١. گریه‌ی شدید بچه ٢. خیش یکپارچه ٣. دانه‌ای که در گندمزار می‌روید ۴. خرام ۵. حالت خرامیدن شاخه و گیاه بر اثر باد ۶. حشره‌ای آبزی ۷. نوعی گندم ۸. حالت خم شدن به پهلو ۹. شیار کج و معوج در شخم

**لارە ـ**[2]: پێشوشە. خوار؛ گێر ‹لارەپێچ؛ لارەسێبەر› ▬ کج ـ

**لارەبا / lareba/**: ناو. لابا؛ خوارەبا؛ بایێ کە نە شەماڵە و نە زریان ▬ باد شرقی یا غربی

**لارەپێچ**[1] **/ larepêç/**: ناو. جۆرێ بەستنەوەی دەسماڵی سەر ▬ نوعی بستن دستار

**لارەپێچ**[2]: ئاوەڵناو. بە لاری پێچراوەوە؛ لار پێچیاگەوە ‹هەر کۆچ ـ کۆچت بوو، فیدای کۆچت بم/ فیدای هەورییەکەی لارەپێچت بم «فولکلۆر»› ▬ کج بسته شده (دستار)

**لارەسا / laresa/**: ناو. لارەسێبەر؛ سێبەری نیوەڕۆژە ▬ سایه‌ی زوالی

**لارەسەنگ / lareseng/**: ☜ **لاسەنگ**[1]**ـ١**

**لارەسێبەر / laresêber/**: ☜ **لارەسا**

**لارەلار**[1] **/ larelar/**: ناو. لارەلارە؛ لارەوەلارەوە؛ کاری لابەلا ڕۆیشتن ‹ئەو لارەلارەت لە چییە؟› ▬ عمل لنگیدن به هر دو طرف در راه رفتن

**لارەلار**[2]: ئاوەڵکار. لارەلارە؛ لارەوەلارەوە ‹هێندەم بۆ تێکە سێ ڕۆژ سەرخۆش بم/ لارەلار بڕۆم هێندە بێ‌هۆش بم «بەختیار زێوەر»› ▬ لنگان ـ لنگان

**لارەلارە / larelare/**: ☜ **لارەلار**

**لارەمل / laremil/**: ئاوەڵناو. ١. گەردن‌کەچ ‹هەموو مەردم لارەملی ئەو کەسەن کە هەر نامرێ و پایەدارە «هەژار، *قورئان*»› ٢. *[کینایە]* چاولەدەست؛ ئاتاج ‹کورە کوردێکی ڕووتەڵەی جل‌شڕ/ کز و لارەمل، پەشێو و دڵ‌پڕ «محەمەد سدیق مەحموودی»› ▬ ١.

گردن‌کج ۲. نیازمند

**لاره‌ملی** / larem(i)lî/: ناو. ۱. گەردن‌کەچی ۲. [کینایە] ئاتاجی ≡ ۱. گردن‌کجی ۲. نیاز؛ احتیاج

**لارەوای** / lareway/: ☜ **لاروایی**

**لارەوەبوو** / larewebû/: ئاوەڵناو. مێل؛ داهاتوو ≡ کج‌شده؛ مایل

**لارەوەلارەوە** / larewelarewe/: ☜ **لارەلار**

**لاری**[1] / larî/: ناو. ۱. خواری؛ چەوتی ۲. یاری؛ گاڵتە؛ کایە؛ گەمە ۳. دژایەتی؛ دوژمنایەتی ٤. سەرەڕۆیی؛ کار و ڕەتی بە قسە نەکردن ٥. [مەجاز] لاساری؛ نەگونجاوی ≡ ۱. کجی ۲. بازی ۳. دشمنی ۴. سرپیچی ۵. بدقلقی

⊡ **لاری کردن**: ۱. لە فەرمان دەر چوون ‹چت پێ دەڵێ، بە قسەی بکە و لاری مەکە!› ۲. گاڵتە/ کایە کردن ≡ ۱. سرپیچی کردن ۲. شوخی و بازی کردن

**لاری**[2]: ئاوەڵناو. سەرناوی جۆرێ مریشک و کەڵەبابی ئەستۆ رووتی باڵابەرزە ‹کەڵەشێری لاری› ≡ لاری (مُرغ و خروس)

**لاڕ** / lař/: ☜ **لەڕ**

⊡ **لاڕ بوون**: ☜ **لەڕ بوون**

**لاڕان** / lařan/: ناو. بەشی ئەستوورایی ڕان ≡ بخش ستبر ران

**لاڕکە** / lař(i)ke/: ناو. ڕکە؛ سەرەوژوورەی سەخت و دژوار ≡ سربالایی تیز

**لاڕن** / lařin/: ناو. جۆرێ دروێنە بەتایبەت هی گەنمەئاوی، کە بە لادا دەیبڕنەوە ≡ نوعی درو از کنار

**لاڕوو** / lařû/: ناو. دیمەنی ڕوخسار لە تەنیشتەوە ≡ نیمرُخ

**لاڕەشە** / lařeşe/: ناو. نەخۆشییەکی ئاژەڵە ≡ طاعون دام

**لاڕی** / lařî/: ☜ **لەڕی**

**لاڕێ**[1] / lařê/: ناو. کەناری ڕێگا؛ قەراخی ڕێ ‹ناو ڕێگا تەق‌تەق، لاڕێ بەردی زل/ کە گەردوون هێشتا پێی نەداوە تل «گۆران»› ≡ کنار جاده

**لاڕێ**[2]: ئاوەڵناو. ۱. لادەر لە ڕێگە ‹ڕێ ئەوانەی کە خۆت چاکەت دەگەڵ کردوون/ نە ئەوانەی کە وە بەر تووڕەیی کەوتوون/ نە ئەوانەش کە لاڕێ بوون «هەژار، قورئان»› ۲. لاسار؛ پێچەقین و نەساز ≡ ۱. مُنحرف ۲. لجباز

⊡ **لاڕێ بوون**: ۱. لە ڕێ لادان ‹... ڕێ ئەوانەی کە خۆت چاکەت دەگەڵ کردوون، نە ئەوانەی کە وە بەر تووڕەیی کەوتوون، نە ئەوانەش کە لاڕێ بوون «هەژار، قورئان»› ۲. [کینایە] بایی بوون؛ لە خۆ دەرچوون ≡ ۱. مُنحرف شدن از راه ۲. مغرور شدن

**لاڕێ کردن**: فریو دان و لە ڕێ دەربردن ≡ از راه به در کردن

**لاڕێ گرتن**: لاڕێ بوون ≡ مُنحرف شدن

**لاڕێگەری** / lařêgerî/: ناو. کلایی؛ کار و ڕەوتی کلا بوون ≡ کجروی

**لاز**[1] / laz/: ناو. ۱. لاسک؛ ڕیخ؛ شیاکە ۲. بەرانی چوار ساڵە ≡ ۱. سرگین ۲. قوچ چهار ساله

**لاز**[2]: ☜ **لاچ**[2]

**لازانیا** / lazanya/: ناو. ۱. ماکارۆنی پەڕە ـ پەڕە بۆ خواردنێکی تایبەت ۲. لێنراوی لازانیا بە سۆسی تەماتە، پەنیر و گۆشتەوە ≡ ۱و۲. لازانیا

**لازگرد** / lazgird/: ناو. جۆرێ کووتاڵی گەزە ≡ نوعی پارچه

**لازم** / lazim/: ئاوەڵناو. ۱. پێویست ‹حەبیب کولکوموو ئیمشەو ژن تێرێ/ لازمە هەرکەس کەڵەی قەن بێرێ! «کولکوموو»› ۲. [ڕێزمان] تێنەپەڕ ≡ ۱و۲. لازم

**لازوویت** / lazûyt/: ناو. ۱. گەنمەشامی؛ گوڵەپێغەمبەرە ۲. لاسکی گەنمەشامی ≡ ۱.

ذرت ٢. ساقەی ذرت

**لازە** / laze/: ناوەڵناو. بێکەسوکار و بێسەرپەرشت ☰ بی‌فامیل و سرپرست

**لاژ** / laj/: ☜ **لاژگ**

**لاژانەسەر** / lajaneser/: ناو. سەراسێ؛ سەرئاسێ ☰ میگرن

**لاژک** / lajik/: ☜ **لاژگ**

**لاژگ** / lajig/: ناوەڵناو. *[پلار]* لاژ؛ لاژک؛ لاژگە: ١. گێژ؛ نەفام؛ کەمئاوەز؛ تێنەگەیشتوو ٢. چەقەسرۆی قسە بێتام ☰ ١. ابله ٢. ژاژخا

**لاژگە** / lajge/: ☜ **لاژگ**

**لاژ ـ لاژ** / laj laj/: ناوەڵکار. لۆژلۆژ؛ بە لاژەلاژ ☰ سلانه ـ سلانه

**لاژنای** / lajnay/: چاوگ. *[پلار]* لاژەلاژ کردن ☰ ژاژ خاییدن

**لاژوار** / lajwar/: ناو. کان؛ کانگای سروشتی ☰ معدن طبیعی

**لاژوور** / lajûr/: ناو. باکوور ☰ شُمال

**لاژە** / laje/: ناو. لاوژە؛ گۆرانی ☰ ترانه

**لاژەبێژ** / lajebêj/: ناو. قامبێژ؛ گۆرانی بێژ ☰ خواننده

**لاژەک** / lajek/: ☜ **لاوژۆکە ـ١**

**لاژەلاژ** / lajelaj/: ناو. ژاوەژاو؛ مزەمز ☰ ژاژخایی

**لاژێر** / lajêr/: ناو. ڕاژێر؛ لای خواروو ☰ پایین

**لاس**[١] / las/: ناو. ١. ☜ **لاخە** ٢. دارێکە لە دار سنجوو دەکا و دڕکی نییە ٣. کۆمای گزرە ٤. مۆز؛ کاری پێکەوە دوان و یەکتر لاواندنەوە بۆ حەزی جینسی ٥. *[شوورەیی]* کاری ژەنینی گۆلەسەگ لە دێڵەبەبا ٦. فریو؛ فریب ٧. لاسک؛ ڕیخ؛ شیاکە ☰ ١. ☜ **لاخە** ٢. درختی جنگلی شبیه سنجد ٣. تودەی گیاه کوبیده ۴. لاس ۵. کلەی سگ نر بر مادە ۶. فریب ٧. سرگین

⊡ **لاس خواردن:** خەڵەتان؛ فریو خواردن ☰ فریب خوردن

**لاس دان:** ١. خاپاندن؛ خەڵەتاندن ٢. قسەی بێتام کردن ٣. مۆز کردن؛ مۆزەمۆز کردن ‹ئیستا ئەڵێم چۆپیی کچان/ بکەم بە هۆی ڕەشمار لاس دان «گۆران»› ☰ ١. فریب دادن ٢. یاوه گفتن ٣. لاس زدن

**لاس کردن:** ١. دروونی گیا بە بێ بەستنی بە باقە ٢. حیلاندنی بە سەبری ئەسپ ٣. شیاکە کردنی ڕەشەوڵاغ ☰ ١. درویدن و جمع نکردن گیاه ٢. شیهه کشیدن آهستەی اسب ٣. سرگین انداختن گاو

**لاس**[٢]: ☜ **لاچ**[٢]

**لاس**[٣]: دەنگەناو. *[شوورەیی]* لاسک؛ دەنگی گۆلەسەگ لە کاتی تاو کردنی دێڵەبەبادا ☰ صدای سگ نر هنگام جفتگیری

⊡ **لاس دان:** *[شوورەیی]* ژەنینی گۆل لە دێڵەبەبا ☰ کله زدن سگ نر بر مادە

**لاسا** / lasa/: ☜ **لاسایی**

⊡ **لاسا کردنەوە:** ☜ **لاسایی کردنەوە**

**لاسابانکەرە** / lasabankere/: ناو. بزنمژە؛ سەرمازەلە ☰ آفتاب‌پرست

**لاسار** / lasar/: ناوەڵناو. لەسار؛ لەسەر: ١. گوێنەبیس ‹کوڕێکی لاسار و باوکێکی هەژار› ٢. ملهوڕ؛ سەرسەخت ‹ئەوێستاش دوژمنی لاسار و بەدفەڕ/ دەکووژێ کوردی بێ‌تاوان و لاشەڕ «هێمن»›. هەروەها: **لاساری** ☰ ١. حرف‌نشنو ٢. دیکتاتور

**لاساکەر** / lasaker/: ناو. کەپوونی؛ کەسێ کە دەمەلاسکەی خەڵک دەکاتەوە ☰ کسی کە ادای دیگران را در می‌آورد

**لاسامە** / lasame/: ناو. ١. شەست؛ ڕێژنە؛ ڕەهێڵە ٢. سێڵاو؛ لاپاو؛ لاخێز ☰ ١. رگبار باران ٢. سیل

**لاساوێ** / lasawê/: ناو. دەمەلاسکە؛ دەمەلاسکێ؛

لاسایی 🇮🇷 ادا؛ تقلید

**لاسایی** / lasayî/: ناو. لاسا؛ دەمەلاسکە؛ دەمەلاسکی 🇮🇷 تقلید

▣ **لاسایی کردنەوە**: ١. لاسا کردنەوە؛ دەمەلاسکەی کردنەوە ٢. چاو (لە کەسێ) بڕین 🇮🇷 ١. ادای (کسی را) درآوردن ٢. تقلید (از کسی) کردن

**لاستیق** / lastîq/: ☜ **لاستیك**

**لاستیک** / lastîk/: ناو. لاستیق؛ لاسیق؛ لاسیک: ١. جیل؛ جیر؛ هەر شتێکی سروشتی یان دەسکردی کێشسان (وەک قایش، کێش و...) ٢. تەگەرە؛ چەرخ ‹لاستیکی پاشەوە پەنچەرە› 🇮🇷 ١و٢. لاستیک

**لاستیکی** / lastîkî/: ناوەلناو. لاسیکی؛ چێکراو لە لاستیک ‹تۆپی لاستیکی› 🇮🇷 لاستیکی

**لاسق** / lasiq/: ☜ **لاسك**[1]ـ٢

**لاسک** / lasik/: ناو. زگ بە لای خاڵیگەوە 🇮🇷 دو طرف شکم

**لاسک**[1] / lask/: ناو. ١. حیلەی سەبری ئەسپ ٢. لاسق؛ لاچک؛ ساقەتە؛ بەژنی گیا ‹کرانە دەستەچیلە لاسکە گۆگەم/ خەزانە و جوانی ناویرێ بلێ هەم «هێمن»› ٣. لاس؛ ڕیخ؛ شیاکە ٤. کاری زمان کێشان لە گەرمان 🇮🇷 ١. شیهەی آرام اسب ٢. ساقە ٣. سرگین ۴. عمل زبان درآوردن و هِن ـ هِن کردن از گرما

**لاسک**[2]: دەنگەناو. [شوورەیی] قرووسکەی گۆلەسەگ لە تاو جووت بوونی لەگەڵ دێڵدا 🇮🇷 صدای نازک سگ نر در لاس زدن با مادە

**لاسکەدەغڵ** / laskedeğł/: ناو. کورۆشە؛ کورۆش؛ کلۆش 🇮🇷 ساقەی غلە

**لاسکەلاسک** / laskelask/: ناو. ١. [شوورەیی] لاسی گۆڵە سەگ ٢. حیلەی لە سەر خۆی ئەسپ ٣. کاری زمان کێشان و پشوو سوار بوون لە گەرمان 🇮🇷 ١. لاس سگ نر ٢. شیهەی آرام اسب ٣. عمل زبان در آوردن و بە هِن ـ هِن افتادن از گرما

**لاسگا** / lasga/: ناو. سەرانگوێلک؛ سەرانگۆلک 🇮🇷 شولە؛ سرگینگاه

**لاسلکی** / lasilkî/: ناو. بێسیم؛ بێتەل 🇮🇷 بی‌سیم

**لاسماڵ** / lasmał/: ناو. کەسێ ئازاڵە لە دەشت کۆ دەکاتەوە 🇮🇷 کسی کە تاپالە جمع می‌کند

**لاسماڵی** / lasmałî/: ناو. کاری کۆ کردنەوەی ئازاڵە لە دەشت 🇮🇷 جمع‌آوری تاپالە

**لاسوڕ** / lasuř/: ناو. ١. دۆخی خلیسکان ٢. خلیسکە؛ جێگەی خلیسکان 🇮🇷 ١. لغزش ٢. لیزگاه

**لاسۆتی** / lasotî/: ☜ **لاسووتاو**

**لاسۆر** / lasor/: ☜ **لاسوور**

**لاسۆرە** / lasore/: ☜ **لاسوور**

**لاسووتاو** / lasûtaw/: ناوەلناو. لاسۆتی: ١. زۆر برژاوی کەمێک لێ سووتاو ‹چەوەندەری لاسووتاو› ٢. زەدەدار (میوەی بێستان) 🇮🇷 ١. نیم‌سوختە ٢. زدەدار (میوەی پالیزی)

**لاسوور** / lasûr/: ناوەلناو. لاسۆر؛ لاسۆرە؛ لاسوورە؛ تایبەتمەندی شتێ کە هێندێکی سوور بێ ‹کولمت سێوی لاسوورە› 🇮🇷 نیم‌سرخ

**لاسوورە** / lasûre/: ☜ **لاسوور**

**لاسەر** / laser/: ناو. تیلاگ؛ لاتیلاگ 🇮🇷 یک طرف سر

**لاسەروو** / laserû/: ناو. ١. سەرەوەی کۆڕ ٢. بەرزایی؛ بڵندایی 🇮🇷 ١. صدر مجلس ٢. بلندی

**لاسەرە** / lasere/: ناو. خشڵێکی ژنانە، بە لایەکی سەریانەوەی قایم دەکەن 🇮🇷 زیوری زنانە

**لاسەمە** / laseme/: ناو. شڵێوە؛ دوودانگ؛ دۆخی بەفر و باران پێکەوە 🇮🇷 حالت باران و برف با هم

**لاسەنگ**[1] / laseng/: ناو. ١. لاخوار؛ لارەسەنگ؛ لالەنگ؛ تاسەنگ؛ باری خوار ٢. تەرازوی تاسەنگ 🇮🇷 ١. بار کج ٢. ترازوی نامیزان (کفەای سنگین و کفەای سبک)

**لاسەنگ**[۲]: ئاوەڵناو. لار؛ خوار ‹سەوز و سوور ڕەنگ/ بە چاو تۆزێ خوار و لاسەنگ «شێرکۆ»› 🇮🇷 کج

**لاسی / lasî/**: ئاوەڵناو. ڕیخاوی 🇮🇷 سرگین‌آلود

**لاسیق / lasîq/**: ☜ لاستیك

**لاسیك / lasîk/**: ☜ لاستیك

**لاسیکی / lasîkî/**: ☜ لاستیکی

**لاش / laş/**: ☜ لاشە

**لاشاخ / laşax/**: ناو. ۱. شانی کێو ۲. ئانیشک 🇮🇷 ۱. ستیغ کوه ۲. آرنج

**لاشان / laşan/**: ناو. ۱. جەمسەری قۆڵ و شان ۲. لاشاخ؛ شانی کێو ۳. لاپاڵی چەوریژکراوی جادەی قیرتاو 🇮🇷 ۱. اطراف کتف ۲. ستیغ کوه ۳. شانەی خاکی جادە

**لاشانخوار / laşanx(i)war/**: ئاوەڵناو. شان‌داچەکاو 🇮🇷 شانە خمیدە

**لاشخۆر / laşxor/**: ناو. لاشەخۆرە؛ لاشەخۆر؛ لاشەوەر: ۱. لەشخۆر؛ هەر جانەوەرێ، حەیوانی تۆپیو بخوا ۲. ڕەشەداڵ؛ داڵ؛ لاشەوەر ۳. *[کینایە، پلار]* پارەداری پیسکەی پارە بە سووتدەر 🇮🇷 ۱. لاشخور ۲. دال سیاه ۳. خسیس رباخوار

**لاشکاو / laş(i)kaw/**: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی شتێ کە لە قەراغەوە شکابێ 🇮🇷 کنار شکستە

**لاشە / laşe/**: ناو. لاش؛ لەش؛ کەلاش؛ کەلەش؛ کەلەخ: ۱. کەلاک؛ لاک؛ لەرگ؛ بەراتە؛ بەلاتە؛ جەندەک؛ مردال؛ مردار؛ مرداری؛ جەستەی گیانەوەری مردوو ‹من و لاشەی پەپوولە ماینەوە و بەس/ شەوی دووری، شەمیش تەواوە لە کۆڕا «هێمن»› ۲. تەن؛ لەخت؛ پەیکەر؛ سەرجەمی پێکهاتەی ماکی بوونەوەری زیندوو 🇮🇷 ۱. لاشە ۲. تن؛ بدن

**لاشەخۆر / laşexor/**: ☜ لاشخۆر

**لاشەخۆرە / laşexore/**: ☜ لاشخۆر

**لاشەڕ / laşeř/**: ئاوەڵناو. ئاشتیخواز؛ دوورەپەرێز لە شەڕ و کێشە ‹لاشەڕم، کوا بەدفەڕم، ئەمما لە سەر مافی ڕەوام/ دەست و چەک، ئیمان و هیوا و هەستی ئاورینم دەوێ «هێمن»› 🇮🇷 آشتی‌طلب؛ صلح‌جو

**لاشەوەر / laşewer/**: ☜ لاشخۆر

**لاشەویلاك / laşewîlak/**: ☜ لاشەویلە

**لاشەویلاکە / laşewîlake/**: ☜ لاشەویلە

**لاشەویلکە / laşewîlke/**: ☜ لاشەویلە

**لاشەویلە / laşewîle/**: ناو. لاشەویلاک؛ لاوشەویلاکە؛ لاشەویلکە؛ دووکەناری کاکیلە 🇮🇷 طرفین آروارە

**لاشیپان / laşîpan/**: ☜ لاشیپانە

**لاشیپانە / laşîpane/**: ناو. لاشیپان؛ هەر یەکە لە دارە درێژەکانی چوارچێوەی درگا 🇮🇷 دو طرف عمودی چهارچوب در

**لاعبکەرە / la'ibkere/**: ئاوەڵناو. لاعبی؛ مەرایی‌کەر؛ زمان‌لووس 🇮🇷 چاپلوس

**لاعبی / la'bî/**: ☜ لاعب‌کەرە

**لاف / laf/**: ناو. ۱. کاری خۆ هەڵکێشان ‹دوێنێ چ بوو دەتدا بە زوبان لافی کەرامەت؟/ ئەمڕۆ نەدەمت بوو، نە دەمت بوو! «نالی»› ۲. فشە؛ درۆ ۳. ☜ لێفە 🇮🇷 ۱. لاف ۲. دروغ ۳. ☜ لێفە

⊡ **لاف لێدان:** خۆ هەڵکێشان؛ پەسنی خۆ دان 🇮🇷 لاف زدن

**لافاو / lafaw/**: ناو. لا؛ لاپاو؛ لاخێز؛ لالاف؛ لاو؛ لووشاو؛ لەهی؛ لەی؛ لەیی؛ لی؛ لێ؛ لێسەر؛ لێیە؛ سێلاو؛ لێمشت ‹لافاو کووچەی جەستەی زووخاڵی/ هەرگاو هەستی هەرچی بوو ماڵی «مەولەوی»› 🇮🇷 سیلاب

**لافاوگێڕەوە / lafawgêřewe/**: ناو. بەست؛ بەند 🇮🇷 سیل‌بند

**لافاهی / lafahî/**: ☜ لاڵە

**لافایی / lafayî/**: ☜ لافاهی

**لافلافۆك / laflafok/**: ☜ لاولاو

**لاف‌وگه‌زاف** / laf û gezaf/: ناو. درۆ و ده‌له‌سه ‹... ـــ چ ده‌ژنــه‌وی؟ ـ لاف‌وگــه‌زاف و چــاووڕاو، باســی گۆشتاو، باسی پلاو ...! «هه‌ژار، *چــوار نامیلکــه*»› ⧗ تُرَّهات

**لافه** / lafe/: ناو. ڕاوه؛ وڕاوه؛ قسه‌په‌ڕێنی ⧗ هذیان

**لافی** / lafî/: ئاوه‌ڵناو. درۆزن ⧗ دروغگو

**لاڤ**[1] / lav/: نــاو. ١. جحێڵ؛ خۆرت؛ گه‌نج ٢. لاڵه؛ کاری پاڕانه‌وه؛ کڕووزانه‌وه ⧗ ١. جوان ٢. لابه

**لاڤ**[2]: ئاوه‌ڵــناو. ١. جحـــێڵ؛ خـــۆرت؛ گـــه‌نج ٢. خوشیک؛ قه‌شه‌نگ؛ جوان له به‌ر چاو ⧗ ١. جوان ٢. زیبا

**لاڤا** / lava/: ☜ **لاڤاهی**

**لاڤاهی** / lavahî/: ناو. لاڤایی؛ لاڤا؛ لاڤــایی؛ کــاری پاڕانه‌وه؛ لالیانه‌وه ⧗ لابه

**لاڤایی** / lavayî/: ☜ **لاڤاهی**

**لاڤرینسیوم** / lavrîns(i)yum/: ناو. توخمی کانزایی ڕادیۆئــه‌کتیڤ، ئــاخرین تــوخمی ده‌ســـته‌ی ئاکتینیــده‌کان، بــه ژمــاره‌ی ئــه‌تومی ١٠٣، کــه ده‌سکرده و له سروشتدا نییه ⧗ لاورنسیم

**لاڤژ** / lavij/: ناو. لاژه؛ قام؛ گۆرانی ⧗ ترانه

**لاڤلاڤ**[1] / lavlav/: ☜ **لاولاو**

**لاڤلاڤ**[2]: ئاوه‌ڵناو. *[کنایه]* زۆر جــوان و خوشــیک ⧗ بسیار زیبا

**لاڤلاڤک** / lavlavik/: ☜ **لاولاو**

**لاڤه** / lave/: ناو. کاری پاڕانه‌وه ⧗ لابه

⊡ **لاڤه کرن**: پاڕانه‌وه؛ لالانه‌وه ⧗ التماس کردن

**لاڤه‌کی** / lavekî/: ناو. کاری به کڕووزه‌وه پاڕانــه‌وه ⧗ التماس و زاری

**لاڤه‌لاڤ** / lavelav/: ناو. پاڕانــه‌وه‌ی زۆر ⧗ لابــه‌ی زیاد

**لاڤشێژ** / lavşêj/: نــاو. سوه‌یل؛ گــه‌لاوێژ ⧗ ســتاره‌ی سُهیل

**لاق**[1] / laq/: ناو. قاچ؛ له به‌ری پاوه تا جومگه‌ی ڕان ⧗ لنگ

⊡ **لاق تێکه‌ڵ هاتن**: هه‌ڵه‌نگووتن؛ ڕه‌ت بــردن؛ پــا هه‌لکه‌فتن ⧗ سکندری خوردن

**لاق چه‌قانـدن**: *[کنایه]* پێ چه‌قاندن؛ سوور بــوون له سه‌ر داوای خۆ ⧗ پافشاری کردن

**لاق داکێشان**: پا درێژ کردنه‌وه ⧗ پا را دراز کردن

**لاق درێژ کردن**: *[کنایه]* مردن؛ لنگ جووت کردن ⧗ رو به قبله شدن؛ مُردن

**لاق له دو نه‌هاتن**: *[کنایه]* ماندوو بوون و هێــزی بزووتن نه‌مان ⧗ خسته شدن

**لاق مقه‌سته کـردن**: لار و لــه‌وێر ڕێگــه ڕۆیـــین ‹حاسل، به‌ری نه‌دام تا ســێ پیالــه‌ی بــه گــه‌رووداکردم ... هاتمه‌وه، لاقم مقه‌سته‌ی ده‌کرد «هــه‌ژار، *چێشتی مجێور*»› ⧗ کج‌وکوله راه رفتن

**لاق**[2]: ئاوه‌ڵناو. داڵگۆشت؛ لاوازی ئێســک‌ده‌رپــه‌ڕیو ⧗ لاغر استخوانی

**لاقدرێژ** / laqd(i)rêj/: ئاوه‌ڵناو. *[پلار]* درێـژی کـز و باریک ⧗ لنگ‌دراز

**لاقرتی** / laqirtî/: ناو. لاقردی؛ گاڵــته و گــه‌پ ⧗ شوخی و تفریح

**لاقرتێ** / laqirtê/: ئاوه‌ڵــناو. زۆربڵـــێ؛ چه‌نــه‌وه‌ر ⧗ وراج

**لاقردی** / laqirdî/: ☜ **لاقرتی**

**لاقنگ** / laqing/: ☜ **لاقوون**

**لاقوزه** / laquze/: ☜ **لاخوزه**

**لاقـوون** / laqûn/: نــاو. *[شــووره‌یی]* لاقــین؛ لاقنــگ؛ لاقینگ؛ نه‌ستوورایی سمت ⧗ ستبری باسن

**لاقـه** / laqe/: ناو. ١. په‌یوه‌ندی ‹من هیچ لاقم بــه سه‌ریه‌وه نییه› ٢. *[ناشیرین]* ده‌سدرێژی جینسی ٣. ☜ **له‌قه‌ـ١** ⧗ ١. علاقه ٢. تجـاوز جنســی ٣. ☜ **له‌قه‌ـ١**

⊡ **لاقــه کــردن**: *[ناشــیرین]* ده‌ســـدرێژی کـــردنی جینسی ‹لاقه‌ی کردووه و هــه‌ڵاتووه!› ⧗ تجـاوز

کردن

**لاقەبڕغە** / laqebirğe/: ناو. لاپاڵوو؛ خاڵیگە؛ لاخالیگە؛ لاکاول؛ قەبرخە ☰ تُهیگاه

**لاقەردی** / laqerdî/: ناو. ١. قسەی زۆر و بێتام ٢. کاری خۆ هەڵکێشانی بە درۆ ☰ ١. سخن بسیار و یاوە ٢. بُلُف

**لاقەفرتە** / laqefirte/: ☜ **لاقەفرتێ**

**لاقەفرتێ** / laqefirtê/: ناو. لاقەفرتە؛ لاقەفڕێ؛ لەقەفرتێ؛ لەقەفڕە؛ کاری پا ڕاوەشاندنی گیانداری تازەکوژراو ☰ لگدپرانی جاندار تازه کشته شده

**لاقەفڕێ** / laqef(i)řê/: ☜ **لاقەفرتێ**

**لاقەکراو** / laqek(i)raw/: ئاوەڵناو. [ناشیرین] گاوراو بە نارەزا ☰ مورد تجاوز جنسی واقع شده

**لاقەید** / laqeyd/: ئاوەڵناو. گەللایی ☰ بی‌بندوبار

**لاقین** / laqîn/: ☜ **لاقوون**

**لاقینگ** / laqînig/: ☜ **لاقوون**

**لاک**[١] / lak/: ناو. ١. کەلاک؛ لاشە ‹دڵی پڕئارەزووی شاهان ژەمێکی سووکەڵەی مارە/ لە دەم مێروولەیەکدا خاکی لاکی مەزن و خوونکارە «هەژار، شەرەفنامە»› ٢. کەپەک و جۆی لە ئاودا کوڵاو بۆ ئاژەڵ و سەگ ٣. ☜ **لاکە** ٤. قالب؛ قالک؛ ڕیتە ٥. قەمچان ٦. ماکی ڕازاندنەوەی نینۆک کە وەک تراوێکی ڕوون یان ڕەنگامە لە نینۆکی دەسوون ٧. تراوێکی سپی بۆ داپۆشین و سپی کردنەوەی هەڵەی نووسراوە ☰ ١. لاشه ٢. نخاله و جو آب‌پز برای خوراک دام و سگ ٣. ☜ **لاکە** ٤. قالب ریخته‌گری ٥. یەقُل‌دوقُل ٦. لاک ناخُن ٧. لاک غلط‌گیری

**لاک**[٢]: ئاوەڵکار. ڕەنگە؛ شایەد ☰ شاید

**لاکان** / lakan/: ☜ **لاکانی**

**لاکانی** / lakanî/: ناو. لاکان؛ لەهان؛ لیان؛ لیهان؛ ژێرپێڵاوێکی لە تووڵ تەنراوی پان کە لە ژێر کەوشی دەبەستن بۆ سەر بەفر ☰ زیرکفشی از ترکه بافته برای پیاده‌روی روی برف

**لاکاول** / lakawil/: ☜ **لاقەبڕغە**

**لاکایا** / lakaya/: ناو. لاکایە؛ گلە کردن؛ ڕەوتی دەردەدڵ کردن ☰ عمل شِکوه کردن

**لاکایۆخ** / lakayox/: ئاوەڵناو. زۆر بە کرووزە و گلەیی لە ژیان ☰ شاکی از زندگی

**لاکایە** / lakaye/: ☜ **لاکایا**

**لاکاییش** / lakayîş/: چاوگ. کرووزانەوە و گلەیی کردن ☰ شکوه و زاری کردن

**لاکتۆز** / laktoz/: ناو. شەکری شیر؛ جۆرێ شەکرە لە شیردایە، لە ئاودا نەختێک دەتوێتەوە، لە دەواسازی، بژیشکی و پیشەسازیدا بە کار دێ ☰ لاکتوز

**لاکردار** / lakirdar/: ئاوەڵناو. جەڵەب؛ بەدجنس ☰ بدجنس

**لاکم** / lakim/: ئاوەڵکار. لاکن؛ ئیتر هەر ئەوەیە؛ چیتر نا ☰ همین و بس

**لاکن** / lakin/: ☜ **لاکم**

**لاکوت** / lakut/: ئاوەڵناو. [پلار] ١. چاوحیز ٢. لاپرەسەن؛ خۆتێهەڵقوتێن ٣. لاخۆر؛ مشەخۆر ☰ ١. هیزچشم ٢. فضول ٣. مُفت‌خور

**لاکوتێ** / lakutê/: ئاوەڵناو. [پلار] زگلەوەڕێن؛ چلێسی خوازەڵۆکی خواردن ☰ شکم‌چران

**لاکومۆر** / lak û mor/: ناو. لۆک؛ لاکی بە مۆز شەقڵ‌کراو ☰ لاک‌ومُهر

**لاکۆ** / lako/: ناو. زبارەی پەمۆچنین ☰ پنبه‌چینی گروهی

**لاکۆت** / lakot/: ناو. پەمۆچینی ☰ پنبه‌چینی

**لاکۆتی** / lakotî/: ناو. پەمۆچن ☰ پنبه‌چین

**لاکۆش** / lakoş/: ناو. ١. خوارەوەی داوێن ‹لاکۆشێک گوێزی هێنابوو› ٢. هاریکاری؛ یارمەتی ‹کەس نایەتە لاکۆشمان› ٣. هەتیمبار؛ بێوەژنی

سێوی‌داری بێ‌ئەنوا و بێ‌کەس 🇮🇷 ١. پایین دامن ٢. کُمک؛ یاری ٣. بیوەی تنگدست سرپرست فرزندان

**لاکۆشکە** / lakoşke/: نـاو. لایـەنگری؛ لاداری 🇮🇷 هواداری

**لاکۆشی** / lakoşî/: ناو. ١. لاکۆشکە؛ لایـەنگری ٢. ئەرکی بێوەژنی سێوی‌دار 🇮🇷 ١. طرفداری ٢. بـار و مسئولیت بیوەی بچەدار

**لاکۆڵ** / lakoł/: ناو. لاکەن؛ لاکەند؛ کار و ڕەوتی لە قەراغەوە کۆڵین 🇮🇷 عمل از کنار کندن

**لاکۆڵان** / lakołan/: ناو. کوچەی تـەنگ و پـەڕ 🇮🇷 پس‌کوچە

**لاکە** / lake/: ناو. لاک؛ ناوێکی گشتی بـۆ هـەموو جۆرە گەشکەی ماسوولەیی، بەتایبـەت شەپلـەی پارکینسۆن ‹زۆر نەخۆشـە، لاکـەی دێ!› 🇮🇷 لقوە؛ حرکت‌بی‌اراده

⊡ **لاکەی سەر هاتن**: *[کینایە]* ١. مانـدوو بـوونی زۆر ٢. کز و زراو بوون ٣. نزیک لە مردن بـوون 🇮🇷 ١. خسـتە شـدن بسـیار ٢. لاغرمُردنـی شـدن ٣. مُشرف بە موت بودن

**لاکەت** / laket/: ئاوەڵناو. لاکـەل؛ لێـوار شـکاو 🇮🇷 لب‌پر

**لاکەفتە** / lakefte/: ☜ **لاکەوتە**

**لاکەل**[1] / lakel/: ناو. جۆرێ تفەنگ 🇮🇷 نوعی تفنگ

**لاکەل**[2]: ☜ **لاکەت**

**لاکەلەکە** / lakeleke/: ناو. تەنیشت 🇮🇷 بغل

**لاکەن** / laken/: ☜ **لاکۆڵ**

**لاکەند** / lakend/: ☜ **لاکۆڵ**

**لاکەوتە** / lakewte/: ئاوەڵناو. لاکەفتـە؛ بارکـەوتو؛ داماو 🇮🇷 درماندە

**لاکی**[1] / lakî/: نـاو. لـۆکی؛ ڕەنگـی سـووری ئەرخەوانی تۆخ 🇮🇷 رنگ لاکی

**لاکی**[2]: ئاوەڵنـاو. لـۆکی؛ بـە ڕەنگـی سـووری ئەرخەوانی تۆخ 🇮🇷 بە رنگ لاکی

**لاکین** / lakîn/: نـاو. ئەشـکەولەت؛ بنـە دەفـری سواڵەتی شکاو 🇮🇷 ظرف سُفالین شکستە

**لاکێش**[1] / lakêş/: نـاو. ١. کـەنارە؛ کنـارە؛ قاڵـی درێژووکە ‹شـێوێ لێ‌نێن سەماوەرێ تێ‌خەن/ هۆدە ڕاخەن بە فەڕش و لاکێشان «حەقیقی»› ٢. لبـادی پان و گەورە ٣. ☜ **لاکێشە** 🇮🇷 ١. قـالی کنـارە ٢. نمد بزرگ ٣. ☜ **لاکێشە**

**لاکێش**[2]: ئاوەڵناو. ١. زۆربێژ؛ زۆربڵێ ٢. جگەرەخۆر لە تووتن و جگەرەی خەڵک ‹... ئەوسا دەیانگوت عەیبە تۆ لاکێشی! ناچار تووتن و پەڕم پەیدا کرد و لە سایەی هەواڵی ناجنسەوە فێرەجگەرە کرام! «هـەژار، چێشتی مجێـور»›. هـەروەها: **لاکێشی** 🇮🇷 ١. وراج؛ رودەدراز ٢. مُفت‌کش

**لاکێشە** / lakêşe/: نـاو. لاکـێش؛ درێژۆکـە؛ بیچمێکی تەختی هەندەسی چـوار لاسـک، کـە لاسـکەکانی بەرامبـەر، یەکسـان و هاوشـانن 🇮🇷 مُستطیل

**لاگا** / laga/: ناو. ١. جێگەی وچان دان لە دەشت ٢. ☜ **لادێ**[1] 🇮🇷 ١. اسـتراحتگاه صـحرایی ٢. ☜ **لادێ**[1]

**لاگایی** / lagayî/: ☜ **لادێیی**

**لاگر** / lagir/: ☜ **لایەنگر**

**لاگری** / lag(i)rî/: ☜ **لایەنگری**

**لاگوێل** / lag(i)wêl/: نـاو. لاگوول؛ لالـوێچ؛ لالـۆچ؛ لالەوێچ؛ لامشـت؛ لاوێـچ؛ لـوێچ؛ پـڕێ دەسـت؛ گوێل؛ گولم 🇮🇷 پُر یک کف دست

**لاگوول** / lagûl/: ☜ **لاگوێل**

**لاگە** / lage/: ☜ **لادێ**[1]

**لاگەیی** / lageyî/: ☜ **لادێیی**

**لاگیر** / lagîr/: ناو. ١. ☜ **لایەنگر** ٢. گیرەی لای سەر 🇮🇷 ١. ☜ **لایەنگر** ٢. گیرەی کنار سر

**لاگیرە** / lagîre/: ناو. زەنبەرێکـە بـە لای سـەرەوە قایم دەکرێ 🇮🇷 زیوری است

**لاگیری** / lagîrî/: ☜ **لایەنگری**

**لاگیەیی** / lag(i)yeyî/: ☜ **لادێیی**

**لال**[1] / lal/: ☜ **لاڵ**[1]-۱

**لال**[2]: ئامراز. لجەم؛ لنک؛ لەکن؛ لە لای ‹کیسکا من لال تەیە› ⇐ نزدِ

**لالا**[1] / lala/: ناو. ۱. *[منداڵانە]* خەو ۲. شەمدانی شیشە لە سەر ⇐ ۱. خواب ۲. لاله؛ شمعدان

⊡ **لالا کردن:** *[منداڵانە]* خەوتنی زارۆک ⇐ خوابیدن کودک

**لا، لا**[2]: ئاوەڵکار. ۱. لە گشت ئالییەوە ‹لا_ لا دەورم گیرا› ۲. لۆ_لۆ؛ لا لە دووی لا ‹لا_ لا هەڵیدەوە!› ⇐ ۱. از هر طرف ۲. لایه_لایه

⊡ **لا.لا گرتن:** گش ئالی گـرتن ⇐ همـه طـرف را گرفتن

**لالاڤ** / lalav/: ☜ **لافاو**

**لالامو** / lalamû/: ئاوەڵناو. *[پەلار]* ڕەشەمەست؛ زۆرمەست و سەرخۆشی بێهۆش ⇐ پاتیل؛ سیاه‌مست

⊡ **لالامو کردن:** وەک مـردوو خـەوتن ‹هێنـدە مەستە لالامو دەکا› ⇐ چون مُردگان خوابیدن

**لالایی** / lalayî/: ناو. ۱. ☜ **لایەلایە** ۲. ڕیایی؛ کلکەسووتە؛ ڕووبینی ⇐ ۱. ☜ **لایەلایە** ۲. ریا و تملُق

**لالغاوە** / lal(i)ğawe/: ☜ **لەغاوە**

**لالکە** / lalke/: ناو. کاری لالانەوە؛ پاڕانەوە ⇐ لابه

**لالکەر** / lalker/: ئاوەڵناو. ۱. ☜ **لالکەهاس** ۲. ڕووبـین؛ ماسـتاوکەر ⇐ ۱. ☜ **لالکەهاس** ۲. مُتملق

**لالکەڕ** / lalkeř/: ناو. ۱. گاڵتەی فەنای بێدەنـگ ۲. کەڕولال ⇐ ۱. نوعی سرگرمی ۲. کرولال

**لالکەهاس** / lalkehas/: ئاوەڵناو. لالکەر؛ تایبەتمەندی کەسێ کە دەپاڕێتەوە ⇐ لابه‌کننده

**لالکیان** / lalk(i)yan/: ☜ **لالان**

**لالکین** / lalkîn/: ☜ **لالان**

**لالوات** / lal(i)wat/: ئاوەڵناو. لاڵوپاڵ؛ بێدەموزوان ⇐ بی‌سروزبان

**لالوێچ** / lal(i)wêç/: ☜ **لاگوێل**

**لالۆ** / lalo/: ناو. لالوو؛ لاله؛ لالی؛ خاڵۆ؛ خاڵ؛ برای دایک ⇐ دایی

**لالۆباسی** / lalobasî/: ☜ **لالەباس**

**لالۆچ** / laloç/: ☜ **لاگوێل**

**لالۆزا** / laloza/: ناو. لالـووزا؛ خاڵـۆزا ⇐ دایـی‌زاده؛ پسر/ دختر دایی

**لالۆژن** / lalojin/: ناو. لالووژن؛ خاڵۆژن؛ ژنی خـاڵ ⇐ زن‌دایی

**لالۆژەنی** / lalojenî/: نـاو. خاڵۆژن؛ زناڵۆ؛ ژنی خاڵ ⇐ زن‌دایی

**لالو** / lalû/: ☜ **لالۆ**

**لالـوت** / lalût/: ئاوەڵـناو. *[پەلار]* لووتـەلا؛ قەڵـس؛ دەنگ لە کەسان گۆڕیو ‹لالووتە لە ئێمـە چـەرخی گـەردوون/ پـێ حەیفـە بـژین بـە بـەختیاری «مـەلا غەفوور»›. هەروەها: **لالووتی** ⇐ قهرکرده؛ آزُرده

**لالوتـە** / lalûte/: ئاوەڵناو. گـن؛ مـنگن ⇐ ویژگـی کسی که تودماغی حرف می‌زند

**لالوزا** / lalûza/: ☜ **لالۆزا**

**لالوژن** / lalûjin/: ☜ **لالۆژن**

**لالـە** / lale/: نـاو. ۱. هەلالـە؛ هەرالـە؛ لوولیـک؛ ئـاگرۆ؛ ڕەبـەنۆک؛ بـووک؛ گولالـە؛ بـابینۆک؛ پاگورگانە؛ پاگوریانە؛ گیایەکی ئالفی سەلکدارە بە گەڵای درێژ و داشـکاوی سـەوز، گوڵـی تـەواو و جـامی زەرد یـان سـوورەوە ۲. گوڵـەمێلاقە؛ گولالەسـوورە؛ گوڵەنیسـان؛ گولیکـا نیسـان؛ گوڵـەبووک؛ گوڵـی ئـەو گیایـە ۳. لەعلـە؛ لالا؛ مەردەنگی؛ شەمدانی شیشەلەسەر کە شـەمێکی تێـدا دەسـووتێ ٤. ☜ **لالـۆ** ⇐ ۱و۲. لالـه ۳. شمعدان ۴. ☜ **لالۆ**

**لالەباس / lalebas/**: ناو. لالەعەباس؛ لالەعەباسی؛ لالەعەبباس؛ لالەعەواس؛ لالەباسی؛ لالۆباسی؛ لالەباشی: ١. خەوەردۆس؛ گیایەکی ئالفی و ڕازێنەیی بە سەلکی قەڵەو، گەڵای درێژۆکەی لێوارە گرنجەوە ٢. گوڵی جوان و بۆنخۆشی سوور، سپی یان زەردی ئەو گیایە کە لە خۆراوا بووندا دەکرێتەوە 🇮🇷 ١. لالەعباسی ٢. گل لالەعباسی

**لالەباسی / lalebasî/**: ☜ **لالەباس**

**لالەباشی / lalebaşî/**: ☜ **لالەباس**

**لالەپ / lalep/**: ناو. کەنارەی لەپی دەست 🇮🇷 کنار کف دست

**لالەخەو / lalexew/**: ناو. خەوی زۆر تا نیوەڕۆ 🇮🇷 خواب تا لنگ ظُهر

**لالەزار / lalezar/**: ناو. گوڵجاڕ 🇮🇷 لالەزار

**لالەعەباس / lale'ebas/**: ☜ **لالەباس**

**لالەعەباسی / lale'ebasî/**: ☜ **لالەباس**

**لالەعەبباس / lale'ebbas/**: ☜ **لالەباس**

**لالەعەواس / lale'ewas/**: ☜ **لالەباس**

**لالەغاوە / laleğawe/**: ☜ **لەغاوە**

**لالەک / lalek/**: ئاوەڵناو. تور؛ لاڵەپەتە 🇮🇷 الکن

**لالەکی / lalekî/**: ناو. لالی؛ ناتوانی لە قسە کردن 🇮🇷 لالی

**لالەمونی / lalemûnî/**: ناو. کار و ڕەوتی گەیاندنی مەبەستی خۆ بە ئاماژەی دەست و سەر و چاو 🇮🇷 لال‌بازی

**لالەنگ / laleng/**: ☜ **لاسەنگ[1]ـ١**

**لالەنگەر / lalenger/**: ناو. ئامرازێکی جۆلایی 🇮🇷 ابزاری در دستگاه بافندگی

**لالەنگی / lalengî/**: ☜ **نارنگی**

**لالەوڕ / lalewiř/**: ئاوەڵناو. نازیرەک و گێلۆکە (زارۆ) 🇮🇷 کودن (کودک)

**لالەومەردەنگی / lalewmerdengî/**: ناو. شەمدانی لە پێش بووک و زاوا 🇮🇷 شمعدان سُفرەی عقد

**لالەوەڕ / lalewer̂/**: ئاوەڵناو. ١. تایبەتمەندی ئاژەڵێ کە لە گەلە دوور ئەکەوێتەوە ٢. *[کنایە]* چەورە و زگ‌لەوەڕێن ٣. *[پلار]* قسەدرێژی کۆڕ جاڕزکەر 🇮🇷 ١. ویژگی حیوانی کە از گلە دور می‌شود ٢. سورچران ٣. رودەدراز موجب زحمت

**لالەوێچ / lalewêç/**: ☜ **لاگوێل**

**لالەیی / laleyî/**: ناو. لالهی؛ ڕەوتی پاڕانەوە؛ لالانەوە 🇮🇷 لابە؛ التماس

**لالهی / lalhî/**: ☜ **لالەیی**

**لالی[1] / lalî/**: ناو. ١. ☜ **لالی** ٢. دەوری مس ٣. *[منداڵانە]* خەتان؛ خەو ٤. ☜ **لالۆ** 🇮🇷 ١. ☜ **لالی** ٢. بشقاب مسی ٣. خواب ۴. ☜ **لالۆ**

**لالی کردن**: خەوتنی زارۆک ‹بەبەکە لالی کردووە› 🇮🇷 خوابیدن کودک

**لالی[2]**: ئامراز. لە کن؛ لە لای 🇮🇷 نزدِ

**لالیچ / lalîç/**: ناو. لەغاوە؛ لالغاوە؛ لالەغاوە 🇮🇷 گوشەی دهان

**لالیلالی / lalîlalî/**: ☜ **لایەلایە**

**لاڵ[1] / lał/**: ناو. ١. لال؛ لاڵ؛ بێزوان؛ کەسێ کە نەتوانێ قسە بکا ٢. لەعل؛ بەردێکی بەنرخ بە ڕەنگی سووری تۆخ و سووری ئامال زەرد ٣. سووری تاریک ٤. میوەی زۆر گەیشتوو 🇮🇷 ١. لال ٢. لعل ٣. سُرخ تیرە ۴. میوەی زیاد رسیدە

**لاڵ[2]**: ئاوەڵناو. ١. لال؛ لاڵ؛ بەبێ توانایی قسە کردن ٢. زۆر گەیشتوو (میوە) 🇮🇷 ١. لال ٢. زیاد رسیدە (میوە)

**لاڵان / lałan/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //لالای؛ دەلالێی؛ بلالە// لالکین؛ لالیان؛ لالیانەوە؛ لالانەوە؛ لالانن؛ لالینەوە؛ لالکیان؛ لالکە کردن؛ لالکەلالک کردن؛ پاڕانەوە؛ پاڕیانەوە؛ لوبانەوە؛ ناورانەوە؛ لەگەڵ کزیانەوەدا داوای شتێ کردن 🇮🇷 لابە کردن

**لالەباس** / lalebas/: ناو. لالەعەباس؛ لالەعەباسی؛ لالەعەبباس؛ لالەعەواس؛ لالەباسی؛ لالۆباسی؛ لالەباشی: ١. خەوەردۆس؛ گیایەکی ئالفی و ڕازێنەیی بە سەلکی قەڵەو، گەڵای درێژۆکەی لێوارە گرنجەوە ٢. گوڵی جوان و بۆنخۆشی سوور، سپی یان زەردی ئەو گیایە کە لە خۆراوا بووندا دەکرێتەوە 🇮🇷 ١. لالەعباسی ٢. گل لالەعباسی

**لالەباسی** / lalebasî/: ☜ **لالەباس**

**لالەباشی** / lalebaşî/: ☜ **لالەباس**

**لالەپ** / lalep/: ناو. کەنارەی لەپی دەست 🇮🇷 کنار کف دست

**لالەخەو** / lalexew/: ناو. خەوی زۆر تا نیوەڕۆ 🇮🇷 خواب تا لنگ ظُهر

**لالەزار** / lalezar/: ناو. گوڵجاڕ 🇮🇷 لالەزار

**لالەعەباس** / lale'ebas/: ☜ **لالەباس**

**لالەعەباسی** / lale'ebasî/: ☜ **لالەباس**

**لالەعەبباس** / lale'ebbas/: ☜ **لالەباس**

**لالەعەواس** / lale'ewas/: ☜ **لالەباس**

**لالەغاوە** / laleğawe/: ☜ **لەغاوە**

**لالەک** / lalek/: ئاوەڵناو. تور؛ لاڵەپەتە 🇮🇷 الکن

**لالەکی** / lalekî/: ناو. لاڵی؛ ناتوانی لە قسە کردن 🇮🇷 لالی

**لالەمونی** / lalemûnî/: ناو. کار و ڕەوتی گەیاندنی مەبەستی خۆ بە ئاماژەی دەست و سەر و چاو 🇮🇷 لال‌بازی

**لالەنگ** / laleng/: ☜ **لاسەنگ**[1]_١

**لالەنگەر** / lalenger/: ناو. ئامرازێکی جۆلایی 🇮🇷 ابزاری در دستگاه بافندگی

**لالەنگی** / lalengî/: ☜ **نارنگی**

**لالەوڕ** / lalewiř/: ئاوەڵناو. نازیرەک و گێلۆکە (زارۆ) 🇮🇷 کودن (کودک)

**لالەومەردەنگی** / lalewmerdengî/: ناو. شەمدانی لە پێش بووک و زاوا 🇮🇷 شمعدان سُفرەی عقد

**لالەوەڕ** / lalewer̄/: ئاوەڵناو. ١. تایبەتمەندی ئاژەڵێ کە لە گەلە دوور ئەکەوێتەوە ٢. *[کینایە]* چەورە و زگلەوەڕێن ٣. *[پلار]* قسەدرێژی کۆڕ جاڕزکەر 🇮🇷 ١. ویژگی حیوانی کە از گلە دور می‌شود ٢. سورچران ٣. رودەدراز موجب زحمت

**لالەوێچ** / lalewêç/: ☜ **لاگوێڵ**

**لالەیی** / laleyî/: ناو. لالهی؛ ڕەوتی پاڕانەوە؛ لالانەوە 🇮🇷 لابە؛ التماس

**لالهی** / lalhî/: ☜ **لالەیی**

**لالی**[1] / lalî/: ناو. ١. ☜ **لاڵی** ٢. دەوری مس ٣. *[منداڵانە]* خەتان؛ خەو ٤. ☜ **لالۆ** 🇮🇷 ١. ☜ **لالی** ٢. بشقاب مسی ٣. خواب ۴. ☜ **لالۆ**

**لالی کردن:** خەوتنی زارۆک ‹بەبەکە لالی کردووە› 🇮🇷 خوابیدن کودک

**لالی**[2]: ئامراز. لە کن؛ لە لای 🇮🇷 نزدِ

**لالیچ** / lalîç/: ناو. لەغاوە؛ لالغاوە؛ لالەغاوە 🇮🇷 گوشەی دهان

**لالیلالی** / lalîlalî/: ☜ **لایەلایە**

**لاڵ**[1] / lał/: ناو. ١. لال؛ لاڵ؛ بێزوان؛ کەسێ کە نەتوانێ قسە بکا ٢. لەعل؛ بەردێکی بەنرخ بە ڕەنگی سووری تۆخ و سووری ئامال زەرد ٣. سووری تاریک ٤. میوەی زۆر گەیشتوو 🇮🇷 ١. لال ٢. لعل ٣. سُرخ تیرە ۴. میوەی زیاد رسیدە

**لاڵ**[2]: ئاوەڵناو. ١. لال؛ لاڵ؛ بەبێ توانایی قسە کردن ٢. زۆر گەیشتوو (میوە) 🇮🇷 ١. لال ٢. زیاد رسیدە (میوە)

**لالان** / lałan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //لالای؛ دەلالێی؛ بلالە// لالکین؛ لالیان؛ لالیانەوە؛ لالانەوە؛ لالانن؛ لالینەوە؛ لالکیان؛ لالکە کردن؛ لالکەلالک کردن؛ پاڕانەوە؛ پاڕیانەوە؛ لوبانەن؛ ناورانەوە؛ لەگەڵ کزیانەوەدا داوای شتێ کردن 🇮🇷 لابە کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەلالان

**لالآندن** / lałandin/: ☜ **لالّنای**

**لالآنن** / lałanin/: ☜ **لالآن**

**لالآنەوە** / lałanewe/: چاوگ. تێنەپەر. //لالایـەوە؛ دەلالـێیەوە؛ بلالـێوە// لالـێنەوە؛ پاڕانـەوە ☰ لابـە کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەلالانەوە

**لالآی** / lałay/: چاوگ. لالانەوە؛ پاڕانەوە. ‹جـام لالا بە زار بـە زگـارەوە/ بـە مینـای شکسـت پارەپـارەوە «بێسارانی»› ☰ لابە و التماس کردن

**لالآیی** / lałayî/: نـاو. ۱. ☜ **لالّـی** ۲. ڕەوتی لـە زوان کەوتن ۳. *[کینایە]* تینوویـەتی زۆر ☰ ۱. ☜ **لالّی** ۲. فرایند از نطق افتادن ۳. تشنگی زیاد

**لالآیی داهاتن**: لـە زۆری تینوویـەتی لاڵ بـوون ‹وەخت بـوو لالایـیم دابـێ، کـەس چـۆڕێ ئـاوی نەدامێ› ☰ از تشنگی لال شدن

**لالّبازی** / lałbazî/: ناو. پانتومیم ☰ پانتومیم

**لالّک** / lałik/: ☜ **لالّە**

**لالّکە** / lałke/: ☜ **لالّە**

**لالّکەلالّک** / lałkelałk/: ☜ **لالّە**

**لالّنای** / lałnay/: چاوگ. لالاندن ☰ لابە کردن

**لالّوپـالّ** / lał û pał/: ئاوەڵـناو. بـێدەنـگ و بێسەروزمان ‹لەو خۆشییە هەردوو گێـژ و وڕ مـان/ بێ ورتە و لاڵوپاڵ و کڕ مان «هەژار، *مـەم و زیـن*»› ☰ بی‌سروزبان؛ خاموش

**لالّە** / łałe/: ناو. لاڤە؛ پارە؛ کـرووزە؛ کولـوز؛ لاڤ؛ لاڤاهی؛ لاڤـایی؛ لالـک؛ لالـکە؛ لالکـە؛ لالکەلالک؛ لاڤەلاڤ؛ لاڤەکی؛ لاوە؛ ڕاڤەر؛ شـاکە؛ شاکەشاک؛ کارەکار؛ مەهدەرڤانی؛ هەوەر؛ وەپـار؛ سکالە؛ داوا کردنی بە گریان و پاڕانەوەوە ☰ لابە

**لالّەپەت** / lałepet/: ئاوەڵـناو. لالەپەترە؛ لالـەپەتە؛ تور؛ تایبەتمەندی کەسـێ کـە لـە قسـە کردنـدا زمانی گرێ دەکا ☰ الکن

**لالّەپەترە** / lałepetre/: ☜ **لالّەپەت**

**لالّەپەتە** / lałepete/: ☜ **لالّەپەت**

**لالـەلالّ** / lałelał/: ناو. *[پلار]* تورەتور؛ دۆخی قسـە بە ڕەوانی بۆ نەهاتن ☰ حالت با لُکنت سخن گفتن

**لالّی** / lałî/: ناو. لالی؛ لالایی؛ بێزوانی ☰ لالی

**لالّیان** / lałyan/: ☜ **لالآن**

**لالّیانەوە** / lałyanewe/: ☜ **لالآن**

**لالّیایۆ** / lałyayo/: چاوگ. لالیانەوە ☰ لابە کردن

**لالّینەوە** / lałînewe/: ☜ **لالآن**

**لام** / lam/: ناو. ۱. پەڵپ؛ بیانوو ۲. کولمە؛ گۆنا ۳. لێ؛ ناوی پیتی بیستوچوارەمینی ئەلفبای زمانی کوردی ٤. قسە و پرسیار ٥. لەتە شیشەی تاقیگە بۆ لە سەر دانانی نموونـەی گیانـداران و خسـتنە ژێر میکروسکۆپ ☰ ۱. بهانـه ۲. گونـه ۳. لام؛ نـام حرف بیست‌وچهارم الفبای زبـان کُـردی ۴. گفتـار ۵. لام

**لامات** / lamat/: ناو. زللە؛ زیللە؛ شەقام ☰ سیلی

**لامالّـە** / lamałe/: نـاو. بێسـتانە گرکـەی دێم ☰ جالیز گرمک در زمین دیم

**لامبا** / lamba/: ☜ **لامپا**

**لامبە** / lambe/: ☜ **لامپا**

**لامـپ** / lamp/: نـاو. چـرا؛ گلـۆپ؛ گولـۆپ؛ کەرەستەی ڕووناکیدەری کارەبایی ☰ لامپ

**لامپا** / lampa/: ناو. لامبا؛ لامبـە؛ لـەمپا؛ لامپـە؛ لەمپە؛ چرای شووشەداری نەوتی ☰ لامپا؛ چـراغ شیشەای

**لامپە** / lampe/: ☜ **لامپا**

**لامژ** / lamij/: ئاوەڵـناو. لامێـژ: ۱. تایبەتمەنـدی بێچووی شیرەخۆرە کە مەمکی کەسێ، جگە لـە دایکی، دەمژێ ۲. تایبەتمەندی کەسـێ کـە لـە جگەرەی خەڵـکی مـژ دەدا ☰ ۱. بچـەای کـە از پستان غیرمادر شیر می‌خورد ۲. ویژگی کسی کـە بـە سیگار دیگران پک می‌زند

**لامسەرلایی** / lamserlayî/: ئاوەڵکار. [کینایە] بە گەللایی؛ بە نابەدڵی و بێ گوێ پێدان ‹کارەکانی لامسەرلایی دەکا!› ☰ سرسری

**لامشت** / lamişt/: ☜ **لاگوێل**

**لامک** / lamik/: ئاوەڵناو. دم و چاو چکۆلە ☰ رخسار کوچک

**لامل**[1] / lamil/: ناو. کەنارەی ئەستۆ ☰ صفحەی گردن

**لامل**[2]: ئاوەڵناو. حولحولی؛ بێبار؛ بێڕێوشوێن ☰ لاقید

**لاملامک** / lam(i)lamik/: ناو. شەویلاکەی خوارەوە ☰ آروارەی زیرین

**لاملزەرد** / lamilzerd/: ئاوەڵناو. [کینایە] جوان و هەڵکەوتە ☰ زیبا و دلربا

**لاموجووم** / lam û cûm/: ☜ **لاموجیم**

**لاموجیم** / lam û cîm/: ناو. لاموجووم: ١. کەمترین قسە لە جوابدا ‹لاموجیم، هیچی نەگوت› ٢. پرس‌وجۆ؛ باس‌وخواس ☰ ١. کمترین پاسخ ٢. سین‌جیم

⊡ **دانە بەر لاموجیم:** زۆر لێ پرسینەوە و بێتاقەت کردن ‹دایانە بەر لاموجیم، بۆ هاتوویەوە؟!› ☰ سین‌جیم کردن

**لامۆ** / lamo/: ئاوەڵناو. ١. بێتام؛ ئاوەکی؛ بێ کاریگەری یان هێزی پێویست ٢. بێگانە لە ناو گەلەدا ☰ ١. آبکی ٢. غریبە در گلە

**لامۆفەک** / lamofek/: ئاوەڵناو. یاخی؛ ئەشقی؛ دژی زاکوونی دەوڵەت ☰ یاغی

**لامە** / lame/: ناو. مەرایی؛ ڕیایی ☰ تملُق

**لامەردوو** / lamerdû/: ☜ **لامێردە**

**لامەردە** / lamerde/: ☜ **لامێردە**

**لامەزەب** / lamezeb/: ئاوەڵناو. لادین؛ لامەزەو؛ لامەسەب؛ لامەسەو: ١. بێدین؛ بێبڕوا ٢. زاڵم؛ بەدکار ٣. نەگونجاو ☰ ١. لامذهب ٢. ستمگر ٣. بدقلق

**لامەزەو** / lamezew/: ☜ **لامەزەب**

**لامەسەب** / lameseb/: ☜ **لامەزەب**

**لامەسەو** / lamesew/: ☜ **لامەزەب**

**لامەلە** / lamele/: ناو. سۆبایی لە سەر لاتەنیشت ☰ شنای بر پهلو

**لامەمک** / lamem(i)k/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی دوو زارۆ کە شیری دایکێک دەمژن ☰ همشیر

**لامی** / lamî/: ناو. ڕۆڵە؛ ئەولاد ☰ فرزند

**لامیجیم** / lamîcîm/: ناو. [کینایە] کاری خۆ هەڵکێشان؛ بە خۆدا هەڵگوتن ☰ لاف و خودستایی

**لامیسک** / lamîsk/: ئاوەڵناو. بێچارە و نەدار ☰ بینوا

**لامێردان** / lamêrdan/: ☜ **لامێردە**

**لامێردە** / lamêrde/: ناو. لامەردوو؛ لامەردە؛ لامێردان: ١. شوێنی میوانان لە ماڵدا ٢. جێگەی میوانانی پیاو لە ڕەشماڵدا ☰ ١. بیرونی خانە؛ مهمانخانە ٢. جای مهمانان در سیاەچادر

**لامێژ** / lamêj/: ☜ **لامژ**

**لان** / lan/: ناو. ١. کونی شێر و کەروێشک ٢. گە؛ مان ٣. لا؛ لایەن ‹لانی کەم› ☰ ١. کُنام شیر و لانەی خرگوش ٢. اعتصاب ٣. طرف؛ حد

⊡ **لانی کۆنە:** کۆنە لان ☰ لانەی قدیمی

**لان کردن:** هێلانە دروست کردن ☰ آشیانە کردن

⊡ **لان گرتن:** پشتیوانی کردن ☰ طرفداری کردن

**لاناو** / lanaw/: ناو. زاراوە؛ زاراف؛ لاهنا؛ دەستەواژە ☰ اصطلاح

**لانتانوم** / lantanum/: ناو. توخمی کانزایی بە ژمارەی ئەتومی ٥٧ و کێشی ئەتومی ١٣٨,٩٠، نەرم، چەکوشخۆر و سپی کە تایبەتمەندی پەڕەپەڕە بوون و تەلبوونی هەیە ☰ لانتانم

**لانجیر** / lancîr/: ناو. دیزەی شیر تێدا هەوێن کردن ☰ دیزی ماست‌بندی

**لانجێنه / lancêne/**: ناو. پنه ☰ تختەی نانوایی

**لاندڕ / landiř/**: ناو. بوودر؛ ڕەهۆڵ ☰ آبکند؛ کند

**لاندک / landik/**: ☜ لانکه

**لانسار / lanisar/**: ناو. نسار؛ لا نزار؛ لای خۆر و با نەگری کێو ‹وەفراوان هۆرزا، شەتاوان مالا/ وەفر لانسار بەردەن وە بالا «بێسارانی»› ☰ طرف سایەسار کوه

**لانک / lan(i)k/**: ☜ لانکه

**لانکۆڵه / lankołe/**: ☜ لانکه

**لانکه / lanke/**: ناو. لانک؛ لانکۆڵه؛ لانه؛ لاندک؛ لەهندک؛ بێشکه؛ دەرگوش؛ دەیدیک ☰ گهواره

☐ **لانکه کردن**: ڕاژان؛ هەژان به نەرمی ‹گەمیەکه به سەر شەپۆلی نەرمی ئاوەکەوه لانکەی دەکرد› ☰ گهوارەای جنبیدن

**لانکەشکاو / lankeş(i)kaw/**: ئاوەڵناو. *[کنایه]* شەل و خوار و خێچ ☰ شل و شکسته

**لانکەیی / lankeyî/**: ناو. کاریتەی میچ به پانەوه ☰ الوار سقف از پهنا

**لانگر / langir/**: ئاوەڵناو. ١. تایبەتمەندی سەگێ که بێ حەپه گاز دەگرێ ٢. ☜ لایەنگر ☰ ١. ویژگی سگی که بدون پارس گاز می‌گیرد ٢. ☜ لایەنگر

**لانگیری / langîrî/**: ☜ لایەنگری

**لانلکوت / lanl(i)kût/**: ناو. ڕەگەز؛ ڕەگەما؛ بنچینه ☰ نژاد

**لانه / lane/**: ناو. ١. ماڵی پەلەوەران ٢. لان؛ کولان؛ کون؛ ماڵی بڕێ گیانداری دڕنده و کەوی (وەک: شێر، مار، ڕێوی، سەگ و ...) ٣. قەد؛ لا ‹به دوو لانه دەگاتەوه› ٤. *[کنایه]* ماڵ؛ جێ‌سانەوەی بنیادەم ٥. کەلەرم؛ کەلەم ☰ ١. آشیانه ٢. لانه؛ کُنام ٣. لا ۴. خانه ۵. کلم

**لانەزێ / lanezê/**: ناو. ڕەگەز؛ ڕەگەما؛ بنچینه ☰ نژاد

**لانەما / lanema/**: ناو. ڕەگەز؛ ڕەگەما؛ بنچینه ☰ نژاد

**لانەواز / lanewaz/**: ئاوەڵناو. لانەوێز؛ لوونەواز: ١. بێ‌کەس و نازشێواو ٢. ڕەبەن و ئاواره ‹لانەواز و بێکەس و مەزلوومن ئێستا قەومی کورد/ گا به دەستی تورکەکان و گا به دەست ئێرانەوه «ئەحمەد موختار جاف»› ٣. هێلانه گومکردوو (باڵدار) ‹وەک باڵندەی لانەواز، تەره و بێ‌ناونیشانم/ چەند شیرینه که دەڵێم من خەڵکی کوردستانم «ئەحمەد محەمەد»› ☰ ١. بیچاره و درمانده ٢. آواره؛ خانەبەدوش ٣. آشیانه گم‌کرده

**لانەوازی / lanewazî/**: ناو. لاتی؛ بەڵەنگازی ☰ بینوایی

**لانەوبان / lanewban/**: ناو. لانەوبانه؛ ماڵ‌وحاڵ ☰ خانه و کاشانه

**لانەوبانه / lanewbane/**: ☜ لانەوبان

**لانەولان / lanewlan/**: ناو. جێگۆڕکێی کەروێشک له ترسان ☰ عمل جا عوض کردن خرگوش از ترس

☐ **لانەولان کردن**: *[مجاز]* تلاندنەوه؛ ئەم‌دیو و ئەودیو کردن ‹لانەولانت کەم، شانەوشانت کەم/ شەو لە نێو جێدا، ڕۆژ لە بەر دیدا «گۆرانی»› ☰ غلتاندن

**لانەوێز / lanewêz/**: ☜ لانەواز

**لانی[1] / lanî/**: ناو. کونی جانەوەرانی کێوی ☰ کُنام حیوانات کوهی

**لانی[2]**: ئامراز. ١. لای ‹لانی سەرووی ساڵێکه› ٢. له لای ‹برام لانی مام پیرۆته› ☰ ١. حدِ ٢. نزدِ

☐ **لانی کەم**: لای کەم؛ لای کەمی؛ لائەقەل ‹لانی کەم هیچ مەکه!؛ لانی کەم مشتێ گەنمم بدەیه!› ☰ حداقل؛ دست‌کم

**لانێک / lanêk/**: ناو. قایمەلان؛ کونی کەروێشک که دەست پێ‌ڕاگەیشتنی بۆ ڕاوچی دژوار بێ ☰ لانەی پنهانی خرگوش

**لاو**[1] / law/: نـاو. ١. خـۆرت؛ جحـێڵ ‹وەکـوو نەرمەهەنگاوی لاوی بەرەو ژوان/ لە جیٚژوانی زیندوو بەگیانی کچی جوان «سوارە»› ٢. کور؛ فرزەنـدەی نێر ٣. ☜ **لافاو** ≡ ١. جوان ٢. فرزند ذکور ٣. ☜ **لافاو**

**لاو**[2]: ئاوەڵناو. ١. خۆرت؛ جحێڵ ‹پێم بڵێ چۆنە کـە تۆ هەر لاوی/ زۆر بـە سـاڵ پـیری بـەلام چـا مـاوی «سوارە»› ٢. خوشیک؛ جوان؛ شەنگ ≡ ١. جوان؛ بُرنا ٢. زیبا

**لاواچ** / lawaç/: نـاو. پەنجـەرەی پچـووک ≡ پنجرەی کوچک

**لاوار** / lawar/: ناو. ئاوار؛ دار و پەردوو ≡ آوار

**لاواز** / lawaz/: ئاوەڵناو. کـز: ١. لـەڕ؛ دالگۆشـت ‹قامکەگەورەی ورگ‌زل، تەوەزەل و تەپوفل/ ئەیوت ئاشـنا نـاخوازم، لـە لاوازان جیـاوازم «هـەژار، پێـنج ئەنگوست»› ٢. کەم‌هێز ‹دەسـتی لاواز و لـەرزۆکی هەلـێنا› ٣. بـە گوشـار و تـەوژمی کەمـەوە ‹بـە دەنگێکـی لاواز شـاتیمانی خوێنـد› ٤. بـە چۆنیەتییـەکی کـزەوە؛ لـە ئاسـتێکی نزمـدا ‹کونگیرەیەکی لاوازە، شتێکی وای لێ شین نابێ› ≡ ١. لاغر ٢تا۴. ضعیف

**لاوازی** / lawazî/: ناو. ١. کزی؛ دالگۆشتی ٢. دۆخ یان چۆنیەتی نەبوونی توانـایی پێویسـت ‹لاوازی سێکسی؛ لاوازی جەستە› ≡ ١. لاغری ٢. ضعف

**لاوان** / lawan/: چاوگ. پاڕانەوە ≡ لابە کردن

**لاوانـدن** / lawandin/: چـاوگ. ١. دڵـدانەوە؛ دڵخۆشی دان ‹لەبەرچی سەرم لێ دەشـێوێنی/ گـا تووڕە ئەبی، گا ئەملاوێنی «فولکلۆر»› ٢. پاڕانەوە ≡ ١. نواختن ٢. لابە کردن

**لاواندنـەوە** / lawand(i)newe/: چـاوگ. تێـەپەڕ. //لاواندتـەوە؛ دەلاوێنیتـەوە؛ بلاوێنـەوە// لاواننـەوە؛ لاوانەوە: ١. لاواندن ‹تاقمێکی تریش هـەبوون کـە لایان وا بووە شێعر زیل و بەمـە و ئاهـەنگ و وشـەی جوان، جگە لە لاواندنەوەی پەردەی دڵ و گـوێ، بـە کـاری شـتی تـر نایـە «سـوارە»› ٢. بـە مـردوودا هەڵگوتن ‹وەها ڕۆڵـەکانی ئەلاوانـدەوە/ دڵـی دار و بەردی ئەتاواندەوە «کـاک ئەحمـەد»› ≡ ١. نـوازش کردن ٢. مرثیە خواندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەلاواندنەوە

**لاواننەوە** / lawannewe/: ☜ **لاواندنەوە**

**لاوانـە**[1] / lawane/: نـاو. ١. قـەراغی بڵـندکراو ٢. قەراغی قەبر ٣. شیپانە؛ لاشـیپانە ٤. دوو دەپـی درێژ لە جەنجەڕدا ≡ ١. کنارەی برآمدە ٢. کنـار و لبەی گور ٣. کنارەی چهارچوب در ۴. دو تختەی بلند چرخ خرمنکوبی

**لاوانە**[2]: ئاوەڵکار. خۆرت‌ئاسایی؛ وەک جحێلان ≡ جوانانە

**لاوانەوە** / lawanewe/: ☜ **لاواندنەوە**

**لاوانـی** / lawanî/: نـاو. خـۆرتی؛ گەنجییـەتی؛ جحێلی؛ لەوەندی ≡ جوانی

**لاوتە** / lawte/: ☜ **لابوت**

**لاوچ** / lawiç/: ناو. کەنداو؛ دڕناو؛ دڕناڵ؛ دەلاو؛ ڕۆ؛ لاوەچ؛ خەلیج؛ پێشـەوەچوویی ئـاوی دەریـا لـە وشکانیدا ≡ خلیج

**لاوچاک** / lawçak/: ئاوەڵناو. جحێڵەی خوشـکۆک ≡ جوان زیباروی

**لاور** / lawir/: ناو. لەور؛ لاوڕ؛ جانەوەری کێـوی ≡ حیوانات وحشی

**لاورگە** / lawirge/: ئاوەڵناو. زگ‌لـەوەڕێن؛ چـەورە ≡ شکم‌چران

**لاوڕ**[1] / lawiř/: ناو. ١. ☜ **لاور** ٢. ☜ **لابڕ**[1]

**لاوڕ**[2]: ☜ **لابڕ**[2]

**لاوژا** / lawja/: ناو. کاکە؛ برا گەورە ≡ برادر بزرگ

**لاوژۆک** / lawjok/: ☜ **لاوژۆکە ـ١**

**لاوژۆکـە** / lawjoke/: نـاو. ١. لاوژۆک؛ لاویـژە؛ لاوێـژە؛ لاژەک؛ لاجـک؛ لاجـەک؛ تـازەجوان؛

دەمڕووت؛ لاوی تازە پێگەیشتوو ٢. خڕەکەی نێو زەنگۆڵە کـە دەلەرێتـەوە ≍ ١. نوجـوان ٢. مغـزی زنگوله

**لاوژه**[1] / lawje/: ناو. ستران؛ گۆرانی؛ قام ≍ ترانه

**لاوژه**[2]: ئامراز. لە بەر ئەوە؛ بۆ ئەوە ≍ زیرا

**لاوس** / laws/: ناو. بنی ئاسمانەی دەم؛ بانی زار لە ژوورەوە ≍ سق

**لاوشەویلاکە** / lawşewîlake/: ☜ **لاشەویلە**

**لاوک** / lawik/: نـاو. گـۆرانی درێـژ و قـەدیمی ≍ ترانەی کلاسیک

**لاوکبێژ** / lawikbêj/: ناو. گۆرانیبێژ ≍ ترانەخوان

**لاوکۆ** / lawko/: نـاو. گـودۆک؛ تـازەلاو؛ نوجـوان؛ لاوک ≍ نوجوان

**لاوکـی** / law(i)kî/: نـاو. تـازەلاوی؛ لاوێـژی ≍ نوجوانی

**لاولا**[1] / lawla/: نـاو. لاونیو؛ دیمـەن لـە پـەناوە ≍ نیمرخ

**لاولا**[2]: ئاوەڵناو. لاونیو؛ قیچەڵقاچ ≍ أریب

**لاولاو** / lawlaw/: نـاو. لافلافـۆک؛ لاڤـلاڤ؛ لاڤلاڤک؛ لەولاو؛ لەولاوە؛ لەلاو؛ لێلافک؛ ئالینـک؛ لۆلاو؛ قـاتۆرک؛ لەتـەولا؛ زلـواک؛ جلـە؛ ڕووەکـی خزۆکی خۆ هەڵکێش بە دار و دیواردا ≍ لبلاب؛ پیچک

**لاولاوه** / lawlawe/: ناو. ١. لەولاوە؛ ئامرازی لێـک قایم کردنی درگا و چوارچێـوە ٢. داروکێکـی بـە بزمار لـە چوارچێـوە دراو بـۆ داخسـتنی درگـا و پەنجەرە ≍ ١. لـولای در ٢. چـوبکی بـە جـای زره بستن در

**لاولووسه** / lawlûse/: ناو. تاسولووس؛ کـاری خـۆ جوان کردن ≍ آرایش؛ بزک

**لاومەت** / lawmet/: ئاوەڵناو. لاو؛ جحێڵ؛ هەرزەکار ≍ جوان

ـ **لاون** / lawin/: پاشەوشە. لاوێنـەر؛ لاوێـن؛ ئـەو کەسەی دەلاوێنێتەوە ≍ ـ نواز

**لاونـا** / lawna/: نـاو. کـار و ڕەوتی دڵـداری دان؛ لاواندن ≍ نوازش

**لاونـای** / lawnay/: چـاوگ. لاواندنـەوە ≍ نـوازش کردن

**لاونـیم** / lawnîm/: ئاوەڵـناو/ ئاوەڵـکار. لار؛ گێـڕ؛ یەکوەری ≍ کج

**لاونیو** / lawnîw/: ☜ **لاولا**

**لاوه** / lawe/: نـاو. ١. کـاری دڵـدانەوە ٢. کـاری پاڕانـــەوە ٣. دەر؛ دەرەو؛ دەرەوە ٤. کـــاری خواستن؛ داوا کردن ٥. ئاوڕ؛ کاری بـەرەو دوا لـێ ڕوانین ≍ ١. نوازش ٢. لابـە ٣. بیـرون ٤. خـواهش؛ طلب ٥. عمل واپس نگریستن

⊡ **لاوه کردن**: لالانەوە؛ پاڕانەوە ≍ لابە کردن

**لاوەتی** / lawetî/: ☜ **لاوی ـ١**

**لاوەچ** / laweç/: ناو. کەنداو؛ خەلیج ≍ خلیج

**لاوەکەر** / laweker/: ئاوەڵناو. ١. داواکـار؛ خوازیـار ٢. شێلگیر؛ سوور لە شوێنگرتنی دۆز و مەبەستدا ≍ ١. خواستار ٢. پیگیر

**لاوەکی** / lawekî/: ئاوەڵناو. لایدە؛ لاییـە؛ لاوەیـی: ١. ناسـەرەکی؛ بەسـتراو بـە شـت یـان پـاژی سەرەکییەوە ‹ئەنـدامی لاوەکـی› ٢. لێوەبـوو لـە شـتی سـەرەکی ‹شـەقامی لاوەکـی؛ کاریگـەری لاوەکی› ٣. *[کینایە]* کەمبایـەخ؛ ناگرینـگ ‹پرسـی لاوەکـی؛ کێشـەی لاوەکـی› ٤. دەرەکـی؛ بیـانی ‹خەڵکی لاوەکی› ≍ ١تا٣. فرعی ٤. خارجی

**لاوەلا** / lawela/: ☜ **لابەلا**

**لاوەلاوه** / lawelawe/: ☜ **لایەلایە**

**لاوەلایی** / lawelayî/: ☜ **لابەلایی**

**لاوەیی** / laweyî/: ☜ **لاوەکی**

**لاوی** / lawî/: نـاو. ١. لاوەتی؛ لاویـەتی؛ لاوێـتی؛ جحێڵی ٢. جوانچاکی ≍ ١. جوانی ٢. زیبایی

**لاویته** / lawîte/: ☜ **لابیته**

**لاویتی / lawîtî/**: ☜ **لاویتی**

**لاویچ / lawîç/**: ☜ **لەویچ**

**لاویژە / lawîje/**: ☜ **لاوژۆکە ـ۱**

**لاویژەیی / lawîjeyî/**: ناو. تـازەلاوی؛ لاوکـی ⇆ نوجوانی

**لاویەتی / lawyetî/**: ☜ **لاوی ـ۱**

**لاوێتی / lawête/**: ☜ **لاوی ـ۱**

**لاوێچ / lawêç/**: ☜ **لاگوێل**

**لاوێژ / lawêj/**: ناو. تازەلاو؛ تازەجەوان ⇆ نوجوان

**لاوێژە / lawêje/**: ناو. ۱. گۆرانی؛ ستران ۲. ☜ لاوژۆکە ـ۱ ⇆ ۱. ترانە ۲. ☜ **لاوژۆکە ـ۱**

**لاوێژی / lawêjî/**: نـاو. تـازەلاوی؛ نۆجـوانی ⇆ نوجوانی

**لاوێن[1] / lawên/**: ناو. چلە بی ناسک بـە ڕیشـەوە؛ نەمامی دار بی ⇆ نهال بید

▪ **لاوێن[2]**: پاشەوشە. دڵـداریدەر ‹ئـەبووژێتـەوە داری چاکی بە ودمی هەناسەی/ شـنەی نەرمـەلاوێنی دەم بای ئەخاتێ «سوارە»› ⇆ ـ نواز

**لاوێنەر / lawêner/**: نـاو. کەسێ کە دەلاوێنێتـەوە ⇆ مداح

**لاوێنی / lawênî/**: ناو. لاوییەتی؛ لاویتی؛ ڕۆژگاری جحێلی؛ تافی جوانی ⇆ دوران جوانی

**لاهنا / lah(i)na/**: ☜ **لاناو**

**لاهۆرە[1] / lahore/**: ناو. ۱. قاش؛ پاژێک لە میوە ۲. پواز؛ هۆرەی بچـووک؛ سـنگێکە لـە درزی داری قەڵشاوی دەنێن تا یـەک نەگرێتـەوە ⇆ ۱. قـاچ؛ برشی از میوە ۲. بِغاز

**لاهۆرە[2]**: ئاوەڵناو. زەبەلاح؛ زلحۆرت ⇆ لندهور

**لاهـوتی / lahûtî/**: ئاوەڵـناو. ئاسمـانی؛ سـەر بـە دنیای سەرتر و بەرتر ⇆ لاهوتی

**لاهیە / lahiye/**: ئاوەڵناو. عاریـە؛ ئەنـدامی بـەدەڵ (ددانی دەسکرد، قژەسەری دەسـکرد و...) ⇆ بـدلی (دندان مصنوعی، کُلاەگیس و ...)

**لاهێز[1] / lahêz/**: ☜ **لاهێزە**

**لاهێز[2]**: ئاوەڵناو. بێتاقەت؛ کەمهێز ⇆ کم‌توان

**لاهێـزە / lahêze/**: نـاو. لاهێـز؛ پشـتیوان ⇆ پشتیبانەی دیوار

**لای / lay/**: ئامراز. بـە لای؛ لـە لای ‹لای منـە› ⇆ نزدِ؛ پیشِ

**لایت / layt/**: ناو. چرا قووە؛ چەرخ؛ جـۆری چـرای دەستی کە بە پیل کار دەکا ⇆ چراغ‌قوە

**لایدە / layde/**: ☜ **لاوەکی**

**لایز / lay(i)z/**: ☜ **لۆسە ـ۱**

**لایق / layiq/**: ☜ **لایەق**

**لای‌لای / laylay/**: ☜ **لایەلایە**

**لایلایە / laylaye/**: ☜ **لایەلایە**

**لایلایی / laylayî/**: ☜ **لایەلایە**

**لایـەتی / layetî/**: نـاو. دژایـەتی؛ بەرهەڵسـتی ⇆ مُخالفت

**لایەحە / layĥe/**: ناو. پرۆژەیاسـا؛ نووسـراوەیێ بـۆ پێشکەش کردن بە لیژنەیەکی بڕیاردەر ⇆ لایحە

**لایەز / layez/**: ئاوەڵناو. ئاومالک ⇆ آب‌آوردە

**لایـەق / layeq/**: ئاوەڵـناو. لایـق؛ شـیاو؛ سـزاوار ⇆ شایان

⊡ **لایەق بون**: ۱. شیاو بـوون ۲. ڕەوا بـوون ⇆ ۱. شایان بودن ۲. روا بودن

**لایەلایـە / layelaye/**: نـاو. لالایـی؛ لالی‌لالی؛ لای‌لای؛ لایلایە؛ لایلایـی؛ لایـی‌لایـی؛ لاوەلاوە؛ لالا؛ دەلالـێ؛ لـۆر؛ لـۆری؛ لـۆری‌لـۆری؛ لـۆرک؛ گۆرانی بۆ دەخەو کردنی زارۆک ‹هـەی لایەلایـە ڕۆڵە لایلایە/ ئەمشەو بەزەییت بە مندا نایـە «هـەژار، *بۆکوردستان*»› ⇆ لالایی

**لایەن / layen/**: نـاو. لایین: ۱. نک؛ جەم؛ کـن ۲. ئالی؛ تەرەف ⇆ ۱. نزد ۲. سو؛ طرف

**لایەنگر / layengir/**: ئاوەڵـناو. لادار؛ لاگـر؛ لاگـیر؛ لانگر؛ لانگیر؛ لایەنگیر؛ داژدار ⇆ طرفدار

**لایـەنگری / laying(i)rî/**: نـاو. لاداری؛ لاگـــری؛ لاگیری؛ لانگری؛ لانگیری؛ لایـەنگیری؛ داژداری؛ کار و ڕەوتی لایەنی یەکێک گرتن ☰ طرفداری

**لایەنگیر / layengîr/**: ☜ **لایەنگر**

**لایەنگیری / layengîrî/**: ☜ **لایەنگری**

**لایەنی / layenî/**: ئامراز. پای؛ لای ☰ طرفِ

**لایی / layî/**: ناو. سەرسـەختی؛ گـوێنەبیسـی ☰ لجبازی

**لاییک / layîk/**: ☜ **لائیك**

**لاییلایی / layîlayî/**: ☜ **لایەلایە**

**لایین / layîn/**: ☜ **لایەن**

**لاییە / layye/**: ☜ **لاوەکی**

**لب / lib/**: ناو. دانە؛ دەنک ☰ دانە

**لبا / l(i)ba/**: ☜ **لباد**

**ڵبا / liba/**: ☜ **لبال**

**لباد / l(i)bad/**: نـاو. لبا؛ لمـەد؛ لـوا؛ لـەبۆ؛ لـەبوو؛ لێیی؛ کولاف؛ نەوو؛ نەوگ؛ بـەرگنی پەسـتواو ☰ نمد

**لبادە / l(i)bade/**: ناو. فەرەنجی ☰ بالاپوش نمدی

**لباس / l(i)bas/**: ☜ **لیباس**

**ڵبال / l(i)bal/**: ئامراز. ڵبا؛ ڵجەم؛ ڵنک؛ لە کـن؛ لە لا؛ لای ☰ نزدِ

**لبان / l(i)ban/**: ناو. تەپاڵەی پێژراو ☰ تاپالە

**لب‌لب[1] / lib lib/**: ئاوەڵناو. دانەـ دانە؛ دەنکـ دەنک ☰ دانە ـ دانە

**لب‌لب[2]**: ئاوەڵکار. دەنکەدەنکەیەک ☰ دانەدانەیی

**ڵبۆ / libo/**: ☜ **لەبۆ[2]**

**ڵبۆ‌ڵبۆ / libo libo/**: ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. لب‌ـــلب؛ دانە‌ـدانە؛ دەنک‌ـدەنک ☰ دانە‌ـدانە؛ یکی‌ـیکی

**لبوودی / libûdî/**: نـاو. کەوانی تیر پێ هاویشتن ☰ کمان تیراندازی

**لبەترێ / l(i)bet(i)rê/**: نـاو. گلار؛ بۆڵ؛ دەنکەترێ ☰ دانەی انگور

**ڵبەر / liber/**: ئـامراز. ۱. بـۆ خـاتری؛ لـە بـەر ۲. بەرانبەری ۳. لە پێش؛ بەر لە ☰ ۱. به خاطر؛ برای ۲. مقابلِ ۳. قبل از؛ پیش از

⊡ **ڵبەر خستن**: بێچـوو پـێ فـڕێ دان ☰ وادار بـه سقط جنین کردن

**ڵبەر کرن**: ۱. دەبەر کردن؛ پۆشـینی جلـک ۲. بێ نووسینەوە لە بیردا هێشتنەوە ☰ ۱. پوشیدن ۲. ازبر/ حفظ کردن

**لبەک / l(i)bek/**: ئاوەڵکار. دەنکێـک؛ دانەیـەک ☰ یک دانه

**لبێ[1] / l(i)bê/**: نـاو. دەڵەمە؛ پەنیری نەگوشـراو ☰ دَلمەی شیر؛ پنیر آبدار

**لبێ[2]**: ئاوەڵکار. بەڵێ؛ بەلی ☰ بلی

**لپ[1] / lip/**: ناو. پەلی دار ☰ شاخه

**لپ[2]**: ئاوەڵناو. لرپ؛ پڕاوپڕ؛ تژە ☰ لبالب؛ پُر

**ڵپاش / lipaş/**: ئاوەڵـناو. ۱. بـێبـڕەو؛ نـاڕەواج ۲. نازیرەک ☰ ۱. کساد ۲. کودَن

**لپرلپر / lipirlipir/**: ئاوەڵـناو. گڕنی ـ گڕنی ☰ زبـر عاجدار

**لپگ / lipg/**: ☜ **لەپک**

**لپلەوس / liplews/**: ناو. دەم و فلچ؛ دەم و لەوس ☰ لب و لوچه

**ڵپێش / lipêş/**: ئاوەڵـناو. ۱. پێشـڕەو ۲. بەقـەدر و حورمەت ☰ ۱. پیشرو ۲. مُحترم

**لتەن / liten/**: چـاوگ. مـیتن؛ مـژینی مـەمک و گوان ☰ مُک زدن

**ڵجەم / licem/**: ئامراز. لە کن؛ لنک ☰ نزد؛ جانبِ

**لچ[1] / liç/**: ناو. ۱. لێوی خوارەوە ۲. قەراغ؛ کـەنارە ۳. ڕێپۆقی چاو ☰ ۱. لـب زیـرین ۲. لبـه؛ کنـاره ۳. ژفک چشم

⊡ **لچ بردنەوە**: لێو ترینجاندن؛ دەم خوار کردنەوە ☰ لب و لوچه درهم کردن

**لچ تەڕ کردن**: *[کنایە]* دەم کردنەوە؛ قسە کـردن

☰ لب تر کردن

**لچ خوار کردنەوە** /کینایە/ لچ خوارەو کردن؛ لچ هەڵاوردن؛ لچ هەڵقرچاندن؛ لچ هەڵقوتاندن؛ لچ هەڵقوتانن؛ کۆ کردنەوەی لێو لە بەر وەڕەزی یان خەمباری ☰ لب گزیدن

**لچ خوارەو کردن** ☜ **لچ خوار کردنەوە**

**لچ خول دان** قسەی بە پەلە کردن ☰ با شتاب حرف زدن

**لچ هەڵاوردن** ☜ **لچ خوار کردنەوە**

**لچ هەڵقرچاندن** ☜ **لچ خوار کردنەوە**

**لچ هەڵقوتاندن** ☜ **لچ خوار کردنەوە**

**لچ هەڵقوتانن** ☜ **لچ خوار کردنەوە**

**لچ هەڵۆگەڕانن** ☜ **لچ هەڵەوگەڕانن**

**لچ هەڵەوگەڕانن** لچ هەڵۆگەڕانن: ١. لێو بەرەو ژوور نووشتاندنەوە ٢. لێوار نووشتاندنەوە ☰ ١. لب برگرداندن ٢. لبه برگرداندن

**لچ**[٢]: ئاوەڵناو. نووسەک؛ بە تایبەتمەندی یان توانانی چەسپاندنەوە ☰ چسبناک

**لچئەستوور** / liç'estûr/: ئاوەڵناو. سێ‌لێف ☰ لب‌کلفت

**لچان**[١] / l(i)çan/: چاوگ. چەسپان؛ نووسان ☰ چسبیدن

**لچان**[٢]: ئاوەڵناو. پڕاوپڕ؛ دارماڵ ☰ پُر؛ لبالب

**لچانلچ** / l(i)çanliç/: ئاوەڵناو. لچانلیچ؛ پڕاوپڕ ☰ لبالب؛ مالامال

**لچانلیچ** / l(i)çanlîç/: ☜ **لچانلچ**

**لچاولچ** / l(i)çawliç/: ئاوەڵکار. لچ بە لچ؛ لێواولێو؛ لێوار بە لێوار ‹لچاولچ دەیدووری› ☰ لب‌به‌لب

**لچبەنە** / liçbene/: ناو. لچوەنە؛ لێواری؛ بەرزی تای دەرگا و پەنجەرە، بۆ نیشتنە سەر یەک و کپ بوون ☰ لب‌بند

**لچخوار** / liçx(i)war/: ئاوەڵناو. دەمچەفت ☰ دهن‌کج

**لچخەنە** / liçxene/: ناو. زەردەخەنە ☰ لبخند

**لچق** / liçiq/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **لینج** ٢. شیرینچک ☰ ١. ☜ **لینج** ٢. شیرین لزج

**لچقەوی** / liçqewî/: ئاوەڵناو. /پلار/ لچن؛ لچۆ؛ لچە؛ لۆچن؛ لۆچوو؛ لەوسن؛ لەوسێ؛ لۆسێ؛ سێ‌لێف؛ وشتەلچ؛ وشترلچ؛ لەوس‌پان؛ لێوئەستوور ☰ لبچور؛ لبشتری

**لچک** / liçik/: ناو. ١. ☜ **لەچک** ٢. کلکەی سەرپۆشی ژنانە ٣. کلکەی پێچی سەری پیاوانە ٤. دەمهەڵبەست؛ دەسماڵێ کە پیاو دەم و لووتی پێ دادەپۆشێ ☰ ١. ☜ **لەچك** ٢. دنبالەی سرپوش زنانە ٣. دنبالەی فروهشتەی دستار مردانه ۴. نقاب

**لچن** / liçin/: ☜ **لچقەوی**

**لچولێو** / liç û lêw/: ناو. دەمولێو ☰ لب‌ولوچه

⊡ **لچولێو کردن** لێو برین بۆ تەمێ کردن ☰ لب بریدن برای تنبیه

**لچولێوشۆڕ** / liç û lêw şoř/: ☜ **لەوسن**

**لچوەنە** / liçwene/: ☜ **لچبەنە**

**لچۆ** / l(i)ço/: ☜ **لچقەوی**

**لچە**[١] / l(i)çe/: ناو. جۆرێ ماسی ☰ نوعی ماهی

**لچە**[٢]: ☜ **لچقەوی**

**لحیم** / l(i)ĥîm/: ☜ **لەحیم**

**لحێف** / l(i)ĥêf/: ☜ **لێفە**

**لحێم** / l(i)ĥêm/: ☜ **لەحیم**

**لخاف** / l(i)xaf/: ☜ **لەغاو**

**لخیز** / l(i)xîz/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **لینج** ٢. شلک و شیاوی با دان و پێچ دان ☰ ١. ☜ **لینج** ٢. انعطاف‌پذیر

**لرپ**[١] / lirp/: ☜ **لرفە**

**لرپ**[٢]: ☜ **لپ**[٢]

**لرچە** / lirçe/: ☜ **لرخ**

**لرچەلرچ** / lirçelirç/: دەنگەناو. لرچەی زۆر ☰

خش-خش پیاپی سینه

**لرخ** / lirx/: دەنگەناو. لرچە؛ خرخری سنگ 🇮🇷 خش-خش سینه

**لرخاندن** / lirxandin/: چاوگ. تێنەپەڕ. //لرخاندت؛ دەلرخێنی؛ بلرخێنە// خرخر کردنی سنگ 🇮🇷 خش-خش کردن سینه

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەلرخاندن

**لرخن** / lirxin/: ئاوەڵناو. قرخن؛ لرخەکەر 🇮🇷 خرخرو

**لرخنای** / lirxnay/: چاوگ. لرخاندن 🇮🇷 خش-خش کردن سینه

**لرخە** / lirxe/: دەنگەناو. نرخە؛ نرقە؛ لرچە؛ دەنگ لە سنگەوە لە بەر تەنگەنەفەسی و نەخۆشی و ماندوویی 🇮🇷 خس - خس سینه

**لرخەکەر** / lirxeker/: ☜ لرخن

**لرسە** / lirse/: ناو. زقران؛ ڕەوتی سووڕان 🇮🇷 چرخش

**لرف** / lirf/: ☜ لرفە

⊡ **لرف دان**: [پلار] هەڵخستن؛ هەڵمەقووت کردن؛ قووت دان بە پەلە 🇮🇷 لُمباندن

**لرفاندن** / lirfandin/: چاوگ. ١. [پلار] هەڵمەقووت کردن؛ بە هەڵپە و پەلە خواردن ٢. دەنگ دەرهاتنی وشتری لۆک ‹لۆکە بۆر لرفاندی› 🇮🇷 ١. لُمباندن ٢. صدا درآوردن شتر نر

**لرفە** / lirfe/: دەنگەناو. لرپ؛ لرف: ١. [پلار] دەنگی هەڵمەقووت کردنی بە پەلە ٢. دەنگی لافاوی بە تەوژم ٣. دەنگی گڕ-گڕی تەندوور ٤. دەنگی بۆڵاندنی بە قەو ٥. ☜ لرفەلرف 🇮🇷 ١. صدای لُمباندن ٢. صدای خروش سیلاب ٣. غُرش تنور مُشتعل ٤. صدای غُرولند ٥. ☜ لرفەلرف

**لرفەلرف**[1] / lirfelirf/: ئاوەڵکار. [پلار] هەڵپەهەڵپ؛ بە لرفەوە 🇮🇷 هولهولکی

**لرفەلرف**[2]: دەنگەناو. لرفە؛ دەنگی بڕێک چوارپەل، کاتی خواردن یان جووتبوون (وەک: وشتر و نێری و ...) ‹کار و کووری بزن و مەڕ/ لرفەلرفی لۆک و نەڕ «هێمن»› 🇮🇷 صدای بعضی حیوانات در برخی حالات

**لرقە** / lirqe/: دەنگەناو. پریکە؛ تریقەی پێکەنین 🇮🇷 هِرهِر

**لرنای** / lirnay/: چاوگ. لەراندن 🇮🇷 لرزاندن

**لرە** / l(i)re/: ☜ لەرە

**لڕ** / liř/: ناو. چەرخ؛ پێچک؛ تەگەرە؛ بازنەئاسایێ کە لە سەر تەوەرەیەک هەڵدەسووڕێ 🇮🇷 چرخ عرابە و گاری

**لز** / liz/: ناو. گیایەکی گەڵاپانی دەشتەکییە، وەک ژەهر گیاندار ئەکوژێ 🇮🇷 گیاهی سمی

**لزگ** / lizg/: ناو. لک؛ لق؛ پەلی ڕووەک 🇮🇷 جوانە

**لژنە** / lijne/: ☜ لێژنە ـ١

**لس** / lis/: ☜ لیس[1]ـ١

**لستن** / listin/: ☜ لێستنەوە

**لستنەوە** / listinewe/: ☜ لێستنەوە

**لستەوپستە** / liste w piste/: ئاوەڵناو. تەواو لێستراوە 🇮🇷 کاملاً لیسیده شده

**لسکە** / liske/: ئاوەڵناو. هۆگر؛ خووپێگرتوو 🇮🇷 مأنوس؛ اُنس گرفته

**لسەر**[1] / liser/: ئاوەڵناو. ١. سەرکەوتوو؛ لە پێش لە ئەزموونەدا ٢. سەرروویی؛ بانگین 🇮🇷 ١. موفق در امتحان ٢. بالایی

**لسەر**[2]: ئامراز. نزیک بە 🇮🇷 در شُرُف

**لسەرخۆ** / liserxo/: ☜ لەسەرخۆ

**لسین** / l(i)sîn/: ☜ لێستنەوە

**لسینەوە** / l(i)sînewe/: ☜ لێستنەوە

**لشتش** / liştiş/: چاوگ. ١. ☜ لێستنەوە ٢. بە دزییەوە پێوەندی گرتن 🇮🇷 ١. ☜ لێستنەوە ٢. مخفیانە تماس گرفتن

**لشتن** / liştin/: ☜ لێستنەوە

**لشته** / lişte/: ئاوەڵناو. زمان پێداساوراوی خوراو 🇮🇷 لیسیده

**لغاڤ** / l(i)ğav/: ☜ لەغاو

**لغاو** / l(i)ğaw/: ☜ لەغاو

⊡ **لغاو بۆ شل کردن:** *[پلار]* ڕێگە دان بە کەسێکی سەربزێو کاری خۆی بکا 🇮🇷 میدان دادن بە آدم خودسر

**لغاو کردن:** ١. لغاو لە دەمی ئەسپ کردن ٢. *[پلار]* گێڕانەوە لە کار؛ ڕێگە نەدان 🇮🇷 ١. لگام زدن ٢. بازداشتن

**لغاو گرتن:** ١. بریندار بوونی دەمی ئەسپ لە لغاوەوە ٢. جڵەو گرتنی سوار کە دابەزێ 🇮🇷 ١. لگام گرفتن؛ زخمی شدن دهان اسب از لگام ٢. افسار گرفتن اسب تا سوار پیاده شود

**لغاو هەڵبڕین:** ١. دەسکەجڵەو بڵند کردن ٢. دەسکەلغاو بە چەقۆ لەت کردن 🇮🇷 ١. لگام برکشیدن ٢. دستەی لگام را بریدن

**لغاوبڕە** / l(i)ğawb(i)ře/: ناو. ١. ☜ لەغاوەبڕکێ ٢. ☜ لغاوەگورگە

**لغاوە** / l(i)ğawe/: ☜ لەغاوە

**لغاوەبڕکێ** / l(i)ğawebiřkê/: ☜ لەغاوەبڕکێ

**لغاوەبڕێ** / l(i)ğaweb(i)řê/: ☜ لەغاوەبڕکێ

**لغاوەگورگە** / l(i)ğawegurge/: ناو. لغاوبڕە: ١. ناوی تۆرەمەیەک باڵندەیە کە بە پۆل دەگەڕێن، هێندێک لە پەڕەسێلکە دەچن. بریتین لە لغاوەگورگە، لغاوەگورگەی باڵ ڕەش و دۆدە ٢. خێزانە باڵندەیەکە لە تۆرەمەیەک هەر بەم ناوە، بە درێژایی نزیک ٢٥ سانتیمیتر، بە باڵی درێژ و تیژ و بۆر، کلکی ڕەش و دوولک، ئاتەگی سپی، لاقی ڕەش، دەندووکی قوڵ، پشتی زەرد و بەرزگی بۆرەوە کە بە پۆل دەگەڕێن و زۆر بە قاژ و قووژن 🇮🇷 ١. گلاریول ٢. گلاریول بال سُرخ

**لف**[١] / lif/: ناو. پێچ؛ ڕەوتی پێچ دان 🇮🇷 پیچ؛ پیچش

**لف**[٢]: ئاوەڵناو. ١. ئاواڵدوانە ٢. جووت؛ شەریک ‹ژن و شوو لفی یەکن› ٣. هاوتا ‹ئەوانە لێک کۆ کەنەوە کە ناهەقی پیشە بوون و لفی وان و ئەوانەش کە دەیانپەرست «هەژار، *قورئان*»› 🇮🇷 ١. همزاد؛ دوقلو ٢. جُفت؛ شریک ٣. مانند

⊡ **لف گرتن:** هاوسەر گرتن؛ ژن هێنان/ شوو کردن 🇮🇷 همسر گرفتن

**لف**[٣]: ئامراز. وەکوو؛ وەکی؛ وێنەی 🇮🇷 مانندِ

**لفانە** / l(i)fane/: ئاوەڵناو. ١. دوانە؛ جمک؛ جووی ٢. شەنگڵەبەرەکەتە؛ شمڵیبەرەکەت 🇮🇷 ١. دوقلو ٢. بههمچسبیده (میوه)

**لفبەلف** / lif be lif/: ☜ لنگاولنگ

**لفت**[١] / lift/: پێرۆ. ← گفتولفت

**لفت**[٢]: لێل. ← لفتولێس

**لفتڕەوان** / liftřewan/: ئاوەڵناو. زارخۆش؛ گفتخۆش؛ دەمڕاوێژخۆش 🇮🇷 شیرینزبان

**لفتولێس** / lift û lês/: ناو. *[پلار]* چڵپەلێسی؛ داهاتی کەم و نارەوا 🇮🇷 لفتولیس

⊡ **لفتولێس کردن:** *[پلار]* چڵپەلێسی کردن؛ داهاتێکی کەم لە ڕێگایەکی نارەواوە دەست خستن و خواردن 🇮🇷 لفتولیس کردن

**لفک** / lifk/: ☜ لفکە

**لفکە** / lifke/: ناو. لفک: ١. پەلکەی سەرپێچەی پیاوان ٢. لۆ؛ کلکەی دەسماڵی سەری ژنان ٣. قۆڵ و سەردەستی درێژ و فشی کراسی کوردی ٤. لیف؛ لیفک؛ لیفکە؛ لیفە؛ کیسەی پارچەیی بۆ خۆ شوتن 🇮🇷 ١. دنبالەی فروهشتەی دستار ٢. دنبالەی سرپوش زنانە ٣. آستین بلند لباس کردی ۴. لیف حمام

**لفکەشامی** / lifkeşamî/: ناو. گیایەکە وەک لفکی حەمام بە کار دەچوو 🇮🇷 گیاهی کە بە جای لیف حمام بە کار میآمد

**لفکەوسۆرانی** / lifke w soranî/: ناو. دەسرە و دەسرۆکەی چۆخەوڕانک ☰ دستار لباس کردی (مردانە)

**لفگری** / lifg(i)rî/: ناو. لفگیری؛ هاوسەرگیری؛ کار و ڕەوتی ژن هێنان و شوو کردن ☰ همسرگُزینی

**لفگیری** / lifgîrî/: ☜ لفگری

**لفلف** / liflif/: ناو. گیایەکە بنەکەی دەخورێ ☰ گیاهی با پیاز خوردنی

**لفه** / l(i)fe/: ناوەڵناو. ئاوەڵدوانە ☰ همزاد

**لفەدوانە** / l(i)fed(i)wane/: ئاوەڵناو. لفەودوانە؛ دوانە؛ جمک؛ جووی ☰ دوقلو

**لفەودوانە** / l(i)fewd(i)wane/: ☜ لفەدوانە

**لڤ** / liv/: ناو. جووڵە؛ بزاو ☰ حرکت

**لڤا** / l(i)va/: ☜ لوا-۱

**لڤان**[۱] / l(i)van/: چاوگ. بزوان؛ جووڵان ☰ حرکت کردن

**لڤان**[۲]: ناو. لەغاو ☰ لگام

**لڤاندن** / l(i)vandin/: چاوگ. بزواندن؛ جووڵاندن ☰ حرکت دادن

**لڤبار** / livbar/: ☜ لڤۆك

**لڤتا** / livta/: ☜ لێره

**لڤد** / livd/: ناو. دڕکێکە بە پنج دەڕوێ ☰ خاربنی بوتەای

**لڤر** / livir/: ☜ لێره

**لڤره** / livre/: ☜ لێره

**لڤك** / livk/: ناو. لوو؛ گرێ لە گۆشتی لەشدا ☰ غُدّه

**لڤن** / livin/: ناو. خشت؛ کەرپیچ؛ کەرپووچ ☰ خشت

**لڤۆك**[۱] / l(i)vok/: ناو. لڤەک؛ لڤبار؛ ئەنیمەیشن؛ فیلمێ کە لە کۆمەڵێک وێنەی یەک لە دوای یەک دروست بووە ‹فیلمی لڤۆک› ☰ کارتون

**لڤۆك**[۲]: ئاوەڵناو. لڤەک؛ لڤبار؛ بزۆز؛ بزۆک؛ دانەسەکناو؛ بێئۆقرە ☰ پُرتحرُک

**لڤۆکی** / l(i)vokî/: ناو. جموجووڵ؛ چالاکی ☰ تحرک

**لڤەك** / l(i)vek/: ☜ لڤۆك

**لڤیان** / livyan/: ☜ لڤین

**لڤی دەرە** / l(i)vîdere/: ☜ لێره

**لڤین** / l(i)vîn/: چاوگ. لڤیان؛ جووڵان؛ بزووتن ☰ جُنبیدن

**لڤێدەری** / l(i)vêderî/: ☜ لێره

**لڤێدەرێ** / l(i)vêderê/: ☜ لێره

**لق** / liq/: ناو. ۱. لک؛ پەلی دار ۲. قۆڵەی لەشکر کە دەکاتە سێیەکی هێز ۳. شاخە؛ بەشێ لە کۆمەڵێک ‹لقی زمان و وێژە› ☰ ۱. شاخە ۲. گردان ارتش ۳. شاخە

**لقاو** / l(i)qaw/: ☜ لەغاو

**لق.لق**[۱] / liq liq/: ئاوەڵکار. پەل-پەل ☰ شاخە-شاخە

**لق.لق**[۲]: دەنگەناو. قا-قا؛ خەنین بە دەنگی بەرز ☰ قاە-قاە

**لقلقی** / liql(i)qî/: ناو. جۆرێ ترێ ☰ نوعی انگور

**لقوپۆ** / liq û po/: ☜ لکوپۆ

**لقوپۆپ** / liq û pop/: ☜ لکوپۆ

**لقونتە** / liqunte/: ناو. چێشت؛ خۆراک ☰ غذای پُخته

**لقونتەچی** / liqunteçî/: ناو. ئاشپەز ☰ آشپز

**لقوز** / l(i)qûz/: ناو. تفنک؛ تیز؛ پلار ☰ متلک

**لك** / lik/: ناو. ۱. لق؛ پەلی دار ‹چاوم لە لکی هومێدە، بۆم دانایە/ ئەی خۆزگە کە داشدەهات بەری هەبوایە «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ۲. پەلکەی دەسماڵ ۳. سووچ و گۆشەی ڕایەخ و قوماش و ... ‹لە قسێکی لەبی پشکووتووە شۆری دوو جیهان/ قسەیەک سەد لەکی مانا لە لکی دامانا «مەحوی»› ٤. خڕایی ڕەق لە بن پێست ٥. گرێ ٦. چەسپ (وەک: سرێش) ☰ ۱. شاخە ۲. دنبالەی فروهشتەی

سرپوش و دستار ۳. گوشەی زیرانداز و پارچە و... ۴. غُدّە ۵. گرە ۶. چسب

◘ **لک لێ دان** ۱. لک دەرهاوردن؛ لک دەرکردن؛ تووشیاری لک لە لەشدا بوون ۲. *[دوعا]* وەکوو تووکێک دەگوترێ ‹یاخوا لک با لێت بۆ کارێ کردت!› ☰ ۱. غُدە درآوردن ۲. نفرینی است

**لکار** / l(i)kar/: ئاوەڵناو. ۱. خەریک؛ سەرقاڵی خەبات ۲. دەکارهێنراو؛ نیمداشت؛ کارکردوو ☰ ۱. مشغول کار ۲. کارکردە

**لکامێر** / l(i)kamêr/: ناو. ئەو ئامێرانەی دوو یان چەن پاژ پێکەوە دەلکێنن (وەک: پێچ، پەرچ، ئەنیشک، سێڕایی و ...) ☰ اتصالات

**لکان** / l(i)kan/: چاوگ. تێنەپەر. //لکای؛ دەلکێی؛ بلکێ// لکیان؛ لکین: ۱. چەسپان؛ نووسان؛ بە هۆی ماکێکی چەسپنەوە بە شتێکەوە چەسپان ‹لکا بە دەستمەوە› ۲. چلکیان؛ خۆش و لەباو بوون ‹بێ تۆ، ئەو نانەم پێوە نالکێ› ۳. ڕەپاڵ دران ‹ئێمە ئەم تۆمەتانەمان پێوە نالکێ› ☰ ۱تا۳. چسبیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: لکاو/ چاوگی نەرێنی: نەلکان

**لکاندن** / l(i)kandin/: چاوگ. تێپەر. //لکاندت؛ دەلکێنی؛ بلکێنە// لکانن: ۱. چەسپاندن؛ بە هۆی ماکێکی چەسپناکەوە بە شتێکەوە چەسپاندن ‹بیلکێنە بە کتێبەکەتەوە› ۲. ڕەپاڵ خستن ‹دەیانویست ئەم کارەیشمان پێوە بلکێنن› ☰ ۱و۲. چسباندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەلکاندن

**لکانگە** / l(i)kange/: ناو. شوێنی پێکەوە لکانی پاژگەلی ئامێر، دەزگا یان تۆڕێک ☰ محل اتصال

**لکانن** / l(i)kanin/: ☜ **لکاندن**

**لکاو** / l(i)kaw/: ئاوەڵناو. لکیاو؛ لکیو؛ لکیاگ؛ چەسپاو ☰ چسبیدە

**لکای** / l(i)kay/: چاوگ. لکان؛ لکیان ☰ چسبیدن

**لکلک**[1] / liklik/: ☜ **لەگلەگ**

**لک.لک**[2]: ئاوەڵناو. گرێ ـ گرێ؛ پڕ لە لک ‹حەلوای لک ـ لک› ☰ غدە ـ غدە

**لک.لک**[3]: دەنگەناو. ۱. باڕەباڕ؛ هاواری مەڕ و بزن ۲. قاـقا؛ پێکەنینی بە دەنگ بەرز ☰ ۱. صدای بلند بُز و گوسفند ۲. قاه ـ قاه

**لکمل** / likmil/: ناو. ئاڵوو؛ بادامە ☰ لوزتین

**لکنای** / liknay/: چاوگ. لکاندن؛ چەسپاندن ☰ چسباندن

**لکوپۆ** / lik û po/: ناو. لقوپۆ؛ لقوپۆپ؛ لق و پەلی دار ☰ شاخوبرگ

**لکوپۆپ** / lik û pop/: ناو. لق و سەرلق ☰ شاخە و سرشاخەهای درخت

**لکوژاندن** / l(i)kujandin/: چاوگ. لەوەڕین لە سەر تازەڕواو؛ ئاخەلێوە کردنی ئاژەڵ ☰ چریدن از گیاه نودمیدە در اوایل بهار

**لکولۆ** / lik û lo/: ناو. گرێ و ڕەقاییەکانی بن پێست ☰ غُدەها

**لکۆ** / l(i)ko/: ئاوەڵناو. زامقی؛ لک؛ لکێن ☰ چسبناک

**ل کوو** / li kû/: ئاوەڵکار. کوێنە؛ کۆگە؛ لە کوێ؛ لە کام جێ ☰ کجا

**لکووژاندن** / l(i)kûjandin/: ☜ **لوکژین ـ۱**

**لکوماندن** / l(i)kûmandin/: چاوگ. هەڵەنگواندن؛ ڕەت پێ دان ☰ سکندری دادن

**لکومین** / l(i)kûmîn/: چاوگ. هەڵەنگووتن؛ ساتمە بردن؛ ڕەت بردن و کەوتن ☰ سکندری خوردن

**لکە** / l(i)ke/: ناو. ۱. گرێ ۲. لک؛ لق ۳. پەلە؛ پنۆک ☰ ۱. گرە ۲. شاخە ۳. لکە

**لکەدار** / l(i)kedar/: ناو. حاچە؛ قەڵبە ☰ شاخەی درخت

**لکەکۆرە** / l(i)kekore/: ناو. لکەکۆرێ؛ گرێ کۆرە ☰ گرە کور

**لکەکۆڕێ** / l(i)kekorê/: ☜ **لکەکۆڕە**

**لکیاگ** / likyag/: ناو. ١. ☜ **لکاو** ٢. تایبەتمەندی گەماڵ و دەڵ کاتی جووت بوون ☰ ١. ☜ **لکاو** ٢. ویژگی سگ هنگام جُفتگیری

**لکیان** / likyan/: چاوگ. ١. ☜ **لکان** ٢. جووت بوونی گەماڵ و دەڵ ☰ ١. ☜ **لکان** ٢. جُفتگیری کردن سگ

**لکیاو** / likyaw/: ☜ **لکاو**

**لکیای** / likyay/: چاوگ. لکان؛ لکیان ☰ چسبیده شدن

**لکین** / l(i)kîn/: ☜ **لکان**

**لکیو** / l(i)kîw/: ☜ **لکاو**

**ل کێدەرێ** / li kêderê/: ناوەلکار. کوێ؛ لە کوێ؛ لە کام شوێن ☰ کجا

**لکێندراو** / l(i)kênd(i)raw/: ناوەلناو. چەسپێنراو ☰ چسبانده شده

**لگبن** / ligbin/: ناو. خشتی کاڵ ☰ خشت خام

**ل گۆرەی** / li gorey/: ئامراز. لگۆرێ؛ بەپێ ☰ طبقِ

**ل گۆرێ** / li gorê/: ☜ **لگۆرەی**

**للا** / lila/: جێناو. هۆی کاورا؛ ئەرێ فلان ☰ فلانی

**لم** / lim/: ناو. ١. لیم؛ لیو؛ ڕەمڵ؛ ڕەلم ٢. زگ؛ سک ‹لم دان› ٣. هۆ؛ سەبەب ٤. فمی چلم؛ کاری لووت سڕین ٥. لیچی سەرەوەی بەراز ☰ ١. ماسه ٢. شکم ٣. سبب ۴. عمل فین کردن ۵. لب زبرین گُراز

**لماو** / l(i)maw/: ناو. لمت؛ قوڕاوی لم؛ لم و ئاوی تێکەلاو ☰ لای و لجن

**لماوی** / l(i)mawî/: ناوەلناو. کۆکک؛ ڕەملی ☰ شنی

**لمب** / limb/: ناو. ماسە؛ ڕەمڵ؛ مڵ؛ لم ☰ ماسه

**لمبۆز** / limboz/: ناو. لمبیز؛ لمبیس؛ لمۆز؛ لمۆڕ؛ لمووز؛ لەمبووز؛ لەمۆز؛ لەمووز؛ پۆز؛ دەم و کەپۆی حەیوان ☰ پوزه

**لمبیز** / limbîz/: ☜ **لمبۆز**

**لمبیس** / limbîs/: ☜ **لمبۆز**

**لمت** / limt/: ☜ **لماو**

**لمتش** / limitş/: چاوگ. ١. وەشارتن؛ شاردنەوە ٢. ناشتن؛ ژێر خاک کردن ☰ ١. پنهان کردن ٢. دفن کردن

**لمر** / limr/: ☜ **لمره**

**لمره** / limre/: ناو. فەن؛ لمر؛ ڕێوشوێنی کردنی کارێ کە فێر بوون و ئەزموونی پێویستە ☰ لم؛ فن

**لمک** / limk/: ناو. خوێاوک؛ تراوی زۆر سوێر ☰ مایع بسیار شور

**لموززراڤ** / l(i)mûzz(i)rav/: ناو. باقۆ؛ نەقە؛ جۆرێ ماسی ☰ ماهی اوزون‌برون

**لمۆڕ**[1] / l(i)moř/: ☜ **لمبۆز**

**لمۆڕ**[2]: ناوەلناو. ڕووگرژ؛ ناوچاوترش ☰ اخمو

**لمۆز** / l(i)moz/: ☜ **لمبۆز**

**لمووز** / l(i)mûz/: ☜ **لمبۆز**

**لمەد** / l(i)med/: ☜ **لباد**

**لنج**[1] / linc/: ناو. ١. سەرکۆنە؛ سەرزەنشت ٢. حەڕی؛ هەرگ؛ قوڕ ٣. لیتە؛ قوڕاوی زۆر شل ☰ ١. سرزنش ٢. گِل ٣. لای و لجن

**لنج**[2]: ناوەلناو. ١. لاسار؛ گوێ نەبیس؛ پێ چەقین ٢. ☜ **لینج** ☰ ١. لجباز ٢. ☜ **لینج**

**لنچق** / linçiq/: ☜ **لینج**

**لنگ** / ling/: ناو. لینگ: ١. لاق؛ لە بەری پێوە تا ڕان ‹لنگی ڕاکێشا› ٢. پێ؛ پا ‹لنگێ خوە مەکە سۆلا تەنگ «مەسەل»› ٣. تا ‹یەک لنگ جەوال› ٤. غار؛ کاری ڕاکردن ‹لنگ دە بزانم!› ☰ ١. لنگ ٢. پا ٣. لنگه ۴. دَو

⊡ **لنگ ئەشتش**: پێ پێدا نان؛ بەر پێ دان ☰ پا بر چیزی گذاشتن

**لنگ ئەشتش قەر**: بە شەق تێ هەڵدان ☰ تیپا

زدن

**لنگ دان:** ١. ڕاکردن؛ غار دان ٢. غار پێ کردن ١. دویدن ٢. دوانیدن

**لنگ هەرسین:** تەزینی لاق؛ مرۆچانە کردنی پا مور- مور کردن پا

**لنگار / lingar/:** ناو. غاری بە پرتاو تاخت

**لنگار دان:** لنگار گرتن؛ بە پرتاو غار پێ کردن؛ چوارناڵە بە ئەسپ کردن تاختن (با اسب)

**لنگار گرتن:** ☜ لنگار دان

**لنگاران / lingaran/:** ناو. ڕکەی غاردان؛ گرێوە غار مسابقەی دو

**لنگاردن / lingardin/:** چاوگ. غار پێ کردن؛ غار دان؛ تاو دان دواندن

**لنگاولنگ / lingawling/:** ئاوەڵناو. لفبەلف؛ لنگاولنگ؛ لنگوەلنگ؛ لینگاولینگ؛ پێوەندیدار یان سەر بە جووتی جۆراجۆر ‹کەوشەکانت لنگاولنگ کەوتوون!› لنگەبەلنگە

**لنگدرێژ / lingd(i)rêj/:** ئاوەڵناو. لۆقلۆقی؛ لۆقی لنگدراز

**لنگرین / ling(i)rîn/:** چاوگ. شەلین؛ لەنگین؛ بە قاچسەقەتی بەڕێوە چوون لنگیدن

**لنگکوت / lingkut/:** ناو. چوارناڵ؛ غار؛ چوارناڵە چهارنعل

**لنگمەتک / lingmetik/:** ئاوەڵناو. ١. پازل؛ پێپان ٢. *[مەجاز]* جووتقۆشە؛ شووم ١. پهن پا ٢. شوم

**لنگوو / lingû/:** ناو. هەویرترش؛ گونکە هەویر کە بۆ هەویرترش هەڵدەگیرێ چونەی خمیرمایە

**لنگە[1] / linge/:** ناو. ١. تا؛ لنگ؛ لف؛ لفە؛ کەرەستەی هاوماڵ یان هاولفی یەکێکی تر کە پێکەوە جووت دەبن و بە کار دێن ‹لنگەی کەوش› ٢. یەکەی ژماردنی تاکێک لە دووی جووت ‹سێ لنگە بار› ٣. جەم؛ لابار؛ لنگەبار؛ یەکەی شتومەکی نێو تەلیس ‹چوار لنگە پیواز؛ دوو لنگە برینج› ٤. لنگ؛ لاق؛ پا؛ قاچ ‹لنگەی راستی سەقەتە!› ٥. بەردێکی دەستاڕ ١تا٣. لنگە ٤. لنگ ٥. سنگ دستاس

**لنگەنەستەنە:** ١. پێ پێدا نان؛ بەر پێ دان ٢. باز هاویشتن؛ باز بردن ١. پا بر چیزی گذاشتن ٢. پریدن

**لنگە[2]:** ئاوەڵناو. لف؛ هاوتا؛ هاوماڵ ‹ئەمیش لنگەی براکەیە!› لنگە؛ جُفت

**لنگەبار / lingebar/:** ☜ لنگە[1]_٣

**لنگەتلوور / lingetillûr/:** ☜ لنگەوتلوور

**لنگەتلوور / lingetilûr/:** ☜ لنگەوتلوور

**لنگەشە / lingeşe/:** ناو. قۆرتە؛ گورگەلۆقە هَروَله

**لنگەشەلە / lingeşele/:** ناو. هەنگەشەلە؛ لنگەشەلێ؛ کاری ڕۆیشتن لە سەر لاقێک لی - لی

**لنگەشەلێ / lingeşelê/:** ☜ لنگەشەلە

**لنگەفرتە / lingefirte/:** ☜ لنگەفرتێ

**لنگەفرتێ / lingefirtê/:** ناو. لنگەفرتە؛ لنگەفرە؛ لنگەفرێ؛ لاقەفرتە؛ کاری پا ڕاوەشاندن (بەتایبەتی گیاندارێکی تازە سەربڕاو) لگدپرانی (بویژه تازه سربُریده شده)

**لنگەفرە / lingef(i)ře/:** ☜ لنگەفرتێ

**لنگەفرێ / lingef(i)řê/:** ☜ لنگەفرتێ

**لنگەلەرزە / lingelerze/:** ☜ لنگەلەرزێ

**لنگەلەرزێ / lingelerzê/:** ناو. لنگەلەرزە؛ لنگەلەرێ؛ چۆنیەتی ئەژنۆ لەرزین لە بێ تاقەتی و ترسان لرزش زانو

**لنگەلەرێ / lingelerê/:** ☜ لنگەلەرزێ

**لنگەوتلوور / linge w tillûr/:** ☜ لنگەوتلوور

**لنگەوتلوور / linge w t(i)lûr/:** ئاوەڵکار. لنگەتلوور؛ لنگەتللوور؛ لنگەوتللوور؛ دەمەوروو؛ دەمەوخوار؛ ڕوو لە زەوی و پشت لە ئاسمان دَمَر؛ دَمرو

**لنگەوژوور / linge w jûr/:** ☜ لنگەوقوچ

**لنگەوقـووچ** / linge w qûç/: ئاوەڵکار. لنگـەوژوور؛ دۆخی کەوتن و قاچ بڵند بوون 🇮🇷 حالت افتـادن و پا به هوا شدن

**لنگهەڵکراو** / linghełk(i)raw/: ☜ قوڵهەڵماڵراو

**لنگوەلنگ** / lingweling/: ☜ لنگاولنگ

**لو** / lu/: ناو. لیچ؛ لێو؛ لەو 🇮🇷 لوچه؛ لب

**لوا** / l(i)wa/: ناو. ۱. لڤا؛ بەرگن؛ تـووکی وشـتر و بەرخ ۲. بەرگنی پەستواو؛ کولاو ۳. ☜ لبـاد 🇮🇷 ۱. پشم شتر و بره ۲. کُرک ۳. ☜ لباد

**لوالەو** / l(i)walew/: ☜ لێوانلێو

**لوان** / l(i)wan/: چاوگ. ۱. ڕۆیشتن؛ چوون ‹بـێ زام خەدەنگ مـوژەی مەهـرەوان/ نەنگـەن وە سـارای قیامەت لوان «مەولەوی»› ۲. ڕەخسان؛ هەڵکەوتن؛ دەست دان ‹چۆنت بۆ لوا بسازە، چەپگەرد/ سووڕانی بە پێی دڵخواز زۆر کەمـە «گـۆران»› 🇮🇷 ۱. رفـتن ۲. ممکن شدن

**لواو** / l(i)waw/: ناو. ڕەخس 🇮🇷 امکان

**لـواوی** / l(i)wawî/: ئاوەڵناو. بە لکـولۆ (گۆشـت) 🇮🇷 پُرغُده (گوشت)

**لوای** / l(i)way/: چاوگ. لوان؛ ڕۆیشـتن ‹یاونـا وە کاو هەردەی کۆسـاری/ لـوا چـەنی دەنـگ زایەڵـەی زاری «خانای قوبادی»› 🇮🇷 رفتن

**لوباندن** / lubandin/: چاوگ. پاڕانەوە؛ لالانەوە 🇮🇷 لابه کردن

**لوبلوبە** / lublube/: ☜ لەبلەبی

**لوت** / lut/: ئاوەڵناو. ڕووت؛ بێ جلک 🇮🇷 لُخت

**لوتـف** / lutf/: ناو. ۱. خاسی؛ چاکی ۲. میهرەبانی 🇮🇷 ۱. خوبی ۲. مهربانی

**لوتک** / lutik/: ☜ لۆتك

**لوتو** / lutû/: ناو. جۆرێ ماسی 🇮🇷 نوعی ماهی

**لوجستیک** / lucistîk/: نـاو. ئـابوور؛ کۆمەڵـەیەک چالاکی بـۆ دابـین کـردنی ئـەوی پێداویسـتییە (وەک: خۆراک، جل، ماڵ)، هـەروەها ئـاز و گـۆز و کەڵتە و ساز کردن 🇮🇷 لُجستیک

**لوچ**[1] / luç/: نـاو. ۱. لچ؛ لێوی خواروو ۲. خزگـەی ماسی 🇮🇷 ۱. لوچـه ۲. جـای گـرد آمـدن ماهیـان در زمستان

**لوچ**[2]: ☜ لچ[1]

**لور** / lur/: ئاوەڵکار. لەوێ؛ لەوێندەرێ 🇮🇷 آنجا

**لوڕ** / luř/: نـاو. ۱. هۆزی سپی پێستی دانیشتووی ڕۆژاوای بەرەو باشووری ئێران ۲. پالانێکی باریکی دووفلیقانەیە لە بن جلەوە دەیخەنە سـەر پشـتی بارەبەر ۳. لوڕی؛ تەژ؛ ژێرجلی بارەبەر 🇮🇷 ۱. لُـر ۲. قسمتی دوشاخه مانند از پالان ستور ۳. عرقگیر ستور

**لوڕکوژ** / luřkuj/: ناو. جۆرێ ترێ 🇮🇷 نوعی انگور

**لوڕی**[1] / luřî/: نـاو. ۱. زمـانی هـۆزی لـوڕ ۲. لـوڕ؛ کورتانۆکـەی دووفلیقانـە ۳. لـوڕ؛ تـەژ؛ ژێرجلـی بارەبەر 🇮🇷 ۱. لُری ۲. پالانچەی دوشاخه ۳. عرقگیـر ستور

**لـوڕی**[2]: ئاوەڵـناو. پێوەندیـدار یـان سـەر بـە لـوڕ ‹کەمانچەی لوڕی› 🇮🇷 لُری

**لوژن** / lujin/: ناو. دووکەڵ کێش 🇮🇷 دودکش

**لوژنـا** / lujna/: نـاو. ۱. هـێڵ؛ خـەتی جـووت ۲. جۆگەی بچووک لە ناو کێڵگەدا 🇮🇷 ۱. شیار شـخم ۲. جوی کوچک در مزرعه

**لوشمە** / luşme/: دەنگەناو. ۱. ناڵە و دەنگی نزم بە دەم گریانـەوە ۲. لووشـەی چڵـمن ۳. دەنـگ و هەنیسک دانی کەر و ئێستر لە دیتنی شـتێ کـە پێی خۆشە 🇮🇷 ۱. مویه ۲. صـدای بـالا کشـیدن آب بینی ۳. صدای اظهار اشتیاق چارپا نسبت به چیزی

**لوعاب** / lu'ab/: ناو. لینجاو 🇮🇷 لعاب

**لوغم** / luğ(i)m/: نـاو. لـەغم: ۱. لەغمـە؛ لەغـەم؛ لوهین؛ ڕێگە بە بن عەرزدا ۲. لەخم؛ مین؛ جۆرێ چەکی شەڕە بە شێوەی بەسـتەیەکی تەقەمـەنی کە بە گەرما، دەنگ یان تەوژم دەتەقێتـەوە 🇮🇷 ۱.

نقب ۲. مین

**لوف** / luf/: ناو. دۆی کولاو بۆ کەشک و ژاژی ⇆ دوغ جوشیده

**لوقمە** / luqme/: ناو. ۱. پاروو؛ تیکە ۲. دەمبەست ۳. نەخۆشی گرفت ٤. قایشێ کە ئاوزەنگی تێدایە ⇆ ۱. لُقمە ۲. پوزەبند ۳. بیماری امتلا ۴. نواری کە رکاب در آن است

⊡ **لوقمە کردن**: تووشی نەخۆشی گرفت بوون ⇆ بە بیماری امتلا دچار شدن

**لوقمە گرتن**: پارووی زل لە دەم نان ⇆ لُقمەی بزرگ برداشتن

**لوقمەڕفێن** / luqmeř(i)fên/: ئاوەڵناو. *[کینایە، پلار]* لوقمەفڕێن؛ چاوچنۆکی چڵێس ⇆ شکم‌پرست بی‌شرم

**لوقمەفڕێن** / luqmef(i)řên/: ☜ لوقمەڕفێن

**لوقمەقازی** / luqmeqazî/: ناو. جۆرێ شیرنییە ⇆ نوعی شرینی

**لوقمەکراو** / luqmek(i)raw/: ئاوەڵناو. دەمبەستراو ⇆ پوزەبستە

**لوقمەگەورە** / luqmegewre/: ئاوەڵناو. پاروو‌گلێن؛ پاروو‌زل؛ گەپ‌تیکە؛ فرەخۆر ⇆ پُرخور

**لوک** / luk/: ناو. لوو؛ لک؛ گرێ گۆشت ⇆ غُدّە

**لوکژین** / lukjîn/: چاوگ. ۱. لکووژاندن؛ لەوەڕین لە ئاخەڵێوە ۲. پرووشە کردنی ئاژەڵ دوای نەخۆشی ⇆ ۱. چریدن از گیاه نورستە ۲. اندک ــ اندک چریدن حیوان تازە شفایافتە

**لوکوش** / lukuş/: ئاوەڵناو. زرینگ؛ زرنگ؛ زیت ⇆ زرنگ

**لوکوموتیڤ** / lukumotîv/: ناو. پێڕاگوێزێکی موتوری کە بە سەر هێڵی ئاسندا دەڕوا و ڕیزێک واگۆنی قەتار لە دووی خۆی ڕادەکێشێ ⇆ لکوموتیو

**لولا** / lula/: ☜ لولە[1]

**لولسە** / lulse/: ئاوەڵناو. شێتۆکە؛ سەرشێت ⇆ خُل‌مزاج

**لولوپەڕ** / lulupeř/: ☜ لیلوپەڕ

**لومە** / lume/: ☜ لومە

**لونایيش** / lunayîş/: ☜ لونايیش

**لونیە** / lun(i)ye/: ☜ لوینە

**لوەی** / l(i)wey/: چاوگ. ڕۆیشتن؛ ڕۆشتن ⇆ رفتن

**لوهین** / luhîn/: ناو. لەغمە؛ لەغەم؛ ڕێگا لە ژێر زەمینەوە ⇆ نقب؛ راه زیرزمینی

**لوی** / luy/: ☜ لویە

**لویر** / luyr/: ☜ لوڕ

**لوینە** / luyne/: ناو. لونیە؛ لووینە؛ ئاشەوان؛ ئاسیاوان ⇆ آسیابان

**لوێ**[1] / l(i)wê/: ناو. فرۆ؛ قاخنات؛ کەرکە ⇆ آغوز

**لوێ**[2]: ☜ لەوێ

**لوێچ** / l(i)wêç/: ☜ لاگوێل

**لوێخەڕۆ** / l(i)wêxeřo/: ناو. ڕیخۆڵە؛ ڕێڵەخۆ ⇆ رودە

**لوێدەری** / l(i)wêderî/: ☜ لەوێ

**لوێر** / l(i)wêr/: ☜ لوڕ

**لوێرە** / l(i)wêre/: ☜ لەوێ

**لوێشک** / l(i)wêşk/: ناو. کولێرە ⇆ گردەنان

**لوێنە** / l(i)wêne/: ☜ لەوێ

**لۆ**[1] / lo/: ناو. ۱. گیایەکی یەکسالەی بەرزەبالای گەڵادەرزییە ۲. تیسک؛ دەستەموویەکی سەر ۳. تا؛ تاڵ؛ داو ٤. توێژ؛ چین ٥. جۆر؛ تەرز ‹و لۆ نابیتن› ٦. لک؛ لوو؛ گرێ گۆشتی ژێر پێست ۷. یەکەی ژمارەی خالانی پەڕی پاسوور ‹سێ لۆ› ۸. لۆ؛ لفکە؛ کلکەی لەچک و سەرپۆش ⇆ ۱. گیاهی است ۲. دستەموی سر ۳. تار ۴. طبقە ۵. طور؛ طرز ۶. غُدّە ۷. ورق؛ هر برگ بازی ۸. دنبالەی روسری

◘ **لۆ خواردن:** تێک ئالان و ئالۆزانی بەن ☰ در هم شدن نخ

**لۆ[٢]:** ئاوەڵکار. ١. بۆ؛ بۆ چی؛ چما ٢. بۆ ئەوە؛ لە بەر ئەمە ☰ ١. چرا ٢. زیرا

**لۆ[٣]:** جێناو. کابرا؛ کاورا ‹وا مەکە لۆ!› ☰ فلانی

**لۆ[٤]:** شبەجملە. ئەی خۆرت؛ ئەی لاو ☰ ای جوان

**•لۆ[٥]:** پاشەوشە. ـ لۆنە؛ ـلا؛ ـتا؛ بە چەن ڕێسە یان دەقەوە ‹بەنەکە سێ لۆ بکەوە!؛ بەڕەکە دوولۆ داخە!› ☰ ـلا

**لۆ[٦]:** ئامراز. بۆ؛ ژ ‹لۆ تۆم هێنایە› ☰ برای

**لۆ[٧]:** پێرۆ. ← **تاك و لۆ**

**لۆبت** / lobit/: ئاوەڵناو. لۆپت؛ زرنگ و چالاک ☰ زرنگ و چابُک

**لۆبڕ** / lobiř/: ئاوەڵناو. پساو و ڕیشاڵی هەڵدراو (گوریس و کەندر) ☰ پاره شده

**لۆبیا** / lob(i)ya/: ناو. لووبیا؛ لووبی؛ لووبیە؛ لۆپک؛ لۆڤک؛ لۆوک؛ فاسولیا؛ فاسۆلیا: ١. گیایەکی ئالیکی هەڵچوو بە گەڵای بلاو، گوڵی سپی ئامال زەرد یان بنەوش و بەری خڕ و خۆراکییەوە ٢. ماشەسوورە؛ ماشەسۆرە؛ ماشەسپی؛ هولیرەباخی؛ قەلووکە؛ دەنکی درێژووکەی ئەو گیایە کە چەند جۆری هەیە و هەمووی دەخورێ ☰ ١و٢. لوبیا

◘ **لۆبیا سور:** چەشنێک لووبیای دەنک سوور و گەورەتر لە ماشەسپیلکە ☰ لوبیا قرمز

**لۆبیاسەوز:** چەشنێک لۆبیا لە ڕیزێکی لە نێو کالانێکی سەوزدایە ☰ لوبیا سبز

**لۆبیا شلە:** لووبیا بازی؛ لووبیا چیتی؛ چەشنێک لووبیای درشت و پەمەیی یان بنەوش بە پەڵەی سپییەوە ☰ لوبیا چیتی

**لۆپ** / lop/: ناو. ١. فەرەنجی ٢. لباد؛ کولاو؛ تەحت؛ تات ٣. بەڕەی ئەستوور ٤. سەرکولمە؛ ڕوومەت ٥. باڵداری مەلەوان (وەک: مراوی) ☰ ١. پالتوی نمدی ٢. نمد گستردنی ٣. گلیم ضخیم ٤. گونە؛ لُپ ٥. پرندەی شناگر (مانند: مرغابی)

**لۆپت** / lopit/: ☜ **لۆبت**

**لۆپک** / lopik/: ناو. ١. داوەڵ؛ داهۆڵ ٢. ☜ **لۆبیا** ٣. کوتیلک؛ کفتەی ساوار ☰ ١. مترسک ٢. ☜ **لۆبیا** ٣. کوفتەی بلغور

**لۆپکە** / lopke/: ناو. جۆرە کرمێکە گەڵای بێستان دەخوا ☰ نوعی کرم آفت جالیز

**لۆت[١]** / lot/: ناو. ١. لۆتە؛ مامەحووچێ؛ پارووی زل ٢. بابۆڵە؛ تیکە ٣. هەنگاو؛ گاڤ؛ شەقاو ٤. لۆتک؛ باز ☰ ١. لقمەی بزرگ ٢. ساندویچ ٣. گام ۴. گام بلند

**لۆت[٢]:** ئاوەڵناو. ڕووت؛ بێ جل ☰ لُخت

**لۆتاڵە** / lotałe/: ناو. ناوی گیایەکی گەڵا باریکی زۆر تاڵە، مالات نایخوا ☰ گیاهی است

**لۆترە** / lot(i)re/: ناو. گورگەلۆقە؛ قۆرتە؛ قۆترە ☰ هَروله

**لۆتک** / lotik/: ناو. لوتک: ١. سەما لە خۆشیان ٢. لۆت؛ باز ☰ ١. رقص و پایکوبی از شادی ٢. پرش

**لۆتکە** / lotke/: ناو. بەلەم ☰ قایق

**لۆتکەوان** / lotkewan/: ناو. قایقەوان؛ بەلەمئاژۆ ☰ قایقران

**لۆتکین** / lotkîn/: چاوگ. هەڵبەزین ☰ جهیدن

**لۆتم** / lotim/: ناو. بەش؛ پشک؛ پاژ ☰ سهم

**لۆتە** / lote/: ناو. ١. ☜ **لۆرتە** ٢. بەرماوی تێکەڵکراوی خۆراک ٣. پارووی زل ٤. ترێی هەڵخراو لە بەر تاو بۆ بوونە مێوژ ☰ ١. ☜ **لۆرتە** ٢. پسماندەی خوراک ٣. لُقمەی بزرگ ۴. انگوری کە برای تبدیل بە کشمش، در معرض تابش آفتاب قرار می‌گیرد

**لۆتەخۆر** / lotexor/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* بابۆڵەبادەر؛ نەگونجاو؛ ناماقووڵ ☰ بی‌شخصیت

**لۆتەر[١]** / loter/: ناو. دووکەک؛ خەڕەک؛ تەشی ☰ دوک

**لۆتەر[٢]:** ئاوەڵناو. زرنگ و چالاک ☰ زِبر و زرنگ

**لۆتی**[1] / lotî/: ناو. بەزمگێڕی بە زوڕنا و دەهۆڵ ‹لۆتی نەیکوتاوە، ئەو هەڵدەپەڕێ! «مەسەل»› ☰ مُطرب

**لۆتی**[2]: ئاوەڵناو. [کینایە] ١. بێحەیا ٢. هەڵەخەرج؛ دەسبڵاو ☰ ١. بی‌شرم ٢. خرّاج

**لۆتیاتی** / lot(i)yatî/: ☜ **لۆتیگەری**

**لۆتیایەتی** / lot(i)yayetî/: ☜ **لۆتیگەری**

**لۆتیخۆر** / lotîxor/: ناو. دەسبڕیی بێشەرمانە ☰ کُلاهبرداری

**لۆتیگەری** / lotîgerî/: ناو. لۆتیاتی؛ لۆتیایەتی؛ لۆتیەتی: ١. بەزمگێڕی بە زوڕنا و دەهۆڵ؛ کاری لۆتی ٢. [کینایە] بێحەیایی ‹لۆتیگەری و بەرەڵایی تا کوێ؟› ☰ ١. خنیاگری ٢. بی‌شرمی

**لۆتیوپۆتی** / lotî w potî/: ئاوەڵناو. عەلۆجەلۆ؛ ڕووت و ڕەجاڵە ☰ اوباش

**لۆتیەتی** / lot(i)yetî/: ☜ **لۆتیگەری**

**لۆج** / loc/: ناو. لۆژ؛ ژووری تایبەتی لە تەماشاخانە، سینەما یان خواردنگە ☰ لُژ

**لۆچ**[1] / loç/: ئاوەڵناو. لوچ؛ چرچ ☰ چروک

**لۆچ**[2]: ☜ **لۆچی**[2]

**لۆچان** / loçan/: چاوگ. چرچ بوون ☰ چروکیدن

**لۆچاو** / loçaw/: ناو. شەپۆلی پچووکی سەر ڕووبار ☰ خیزاب

**لۆچاوی** / loçawî/: ئاوەڵناو. چرچ؛ لۆچ؛ هەڵقرچاو ☰ چروکیده

**لۆچکە** / loçke/: ☜ **لەواشە -١**

**لۆچن** / loçin/: ☜ **لچقەوی**

**لۆچنای** / loçnay/: چاوگ. لۆچ کردن ☰ چروک کردن

**لۆچوو** / loçû/: ☜ **لچقەوی**

**لۆچە**[1] / loçe/: ناو. لێوی خوارووی یەکسم ☰ لب زیرین ستور

**لۆچە**[2]: ☜ **لۆچی**[2]

**لۆچی**[1] / loçî/: ناو. لۆچاوی؛ دۆخی لۆچ بوون ☰ چروکیدگی

**لۆچی**[2]: ئاوەڵکار. لۆ؛ لۆچ؛ لۆچە؛ بۆ؛ بۆچی ☰ چرا

**لۆچیای** / loçyay/: چاوگ. لۆچ بوون ☰ چروک شدن

**لۆخ**[1] / lox/: ناو. ١. پەردەی تەنکی نێوان گۆشت و پێستی زیندوو ٢. داری گەندەڵ ٣. بەفری شل کە زوو دەتوێتەوە ٤. توێ؛ توێژە ٥. شیرنی خەرمان سوور بوون ٦. گوڵی وشکی قامیش ☰ ١. غِشا ٢. چوب پوسیده ٣. برف شُل کە زود آب می‌شود ۴. لایه ۵. انعام برداشت خرمن ۶. خوشەی خشک نی

• **لۆخ**[2]: پاشگر. ـ دان؛ جێگەی ئامراز ‹فیشەکلۆخ› ☰ ـ دان

**لۆخان** / loxan/: ناو. لۆغان؛ بەزم و زەماوەند ‹شای لۆخان› ☰ بزم و سرور گروهی

**لۆخانە** / loxane/: ناو. ١. شیلاوگ؛ ئەندامێکی پڕ چرچ و لۆچە لە ناو کرش‌دا ٢. لۆغانە؛ بەخشش بە هۆی خەرمان سوور بوون ☰ ١. هزارلا در سیرابی ٢. انعام برداشت خرمن

**لۆخەندان** / loxendan/: ناو. فیشەکدان؛ زەڕ؛ ڕەخت ☰ خشاب

**لۆد** / lod/: ناو. ١. بارە گیا ٢. ☜ **لۆدە -١** ☰ ١. بار گیاه ٢. ☜ **لۆدە -١**

**لۆدر** / lodir/: ناو. ماشینێک بە دەمە یان بێڵێکی زل و قووڵەوە بۆ هەڵگرتنی شت (خاک و بەرد، بەفر و ...) و هەڵڕژاندنی لە شوێنێکی‌تر ☰ لودر

**لۆدە** / lode/: ناو. ١. لۆد؛ لەودە؛ لێدە؛ چەن باقە گیای دووراو ٢. ڕەوەبەراز ☰ ١. تودەی بر هم انباشتەی علوفه ٢. رمەی خوک

**لۆر**[1] / lor/: ناو. ١. ☜ **لۆرک -١** ٢. دەنگ و هەوای بلوێر ٣. جێگە؛ شوێن ٤. کردار؛ ئاکار ٥. کاری ڕۆیشتنی بە شلەپەتەیی ٦. چلۆنایەتی؛

چۆنیەتی ‹شتی وا نە بە زۆرە، بە لۆرە «مەسەل»› ٧. لایلایی بۆ زارۆکی ساوا ٨. گـۆرانی بـە سـەبر ٩. قامێکە ١٠. خواردنێکە لە شـیر و تـیـژاوی پـەنیر دەکرێ ☰ ١. ☜ **لۆرك ـ١** ٢. آواز نی ٣. جا؛ مکان ۴. روش؛ منش ۵. عمل شُل و وِل راه رفتن ۶ حالت؛ کیفیت ٧. لالایی برای نوزاد ٨. ترنُم ٩. آهنگی اسـت ١٠. لور؛ از فراوردەهای لبنی

**لۆر**[٢]: دەنگەناو. ١. گریان بە دەنگی گڕ ٢. دەنگ و هەوای بلوێر ☰ ١. گریەی با صدای خشن ٢. آواز نی

**لۆراسی** / lorasî/: ناو. ١. لۆریاسی؛ جۆرێ شـووتی درێژووکە ٢. جـۆرێ کـدووی درێـژ ☰ ١. نـوعی هندوانەی دراز ٢. نوعی کدوی دراز

**لۆراندن** / lorandin/: چـاوگ. تێپەڕ. //لۆرانـدت؛ دەلۆرێنی؛ بلۆرێنـە// ١. گۆرانی گوتنی بە سەبر ٢. گریان بە دەنگی گڕ و لەرزۆک ٣. لایلایی کردنی دایک بۆ منداڵ ☰ ١. تـرنُم کـردن ٢. گریسـتن بـا صدای خشن و لرزان ٣. لالایی خوانـدن مـادر بـرای کودک

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەلۆراندن

**لۆراندنـەوە** / lorand(i)newe/: چـاوگ. ١. ☜ **لوراندن** ٢. ژەندنی بلـوێر ☰ ١. ☜ **لورانـدن** ٢. نی نواختن

**لۆرانـەوە** / loranewe/: چـاوگ. تێپەڕ. //لۆرایـەوە؛ دەلۆرێیەوە؛ بلۆرێـوە// لۆریانـەوە؛ لۆرینـەوە؛ لەبـەر خۆوە گۆرانی خوێندن ☰ ترنُم کردن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەلۆرانەوە

**لۆرت** / lort/: ☜ **لۆرد**[٢]

**لۆرتە** / lorte/: ناو. لۆتـە؛ ترێـی پڵیشـاو ☰ انگـور لهیده

**لـۆرد**[١] / lord/: نـاو. ڕێزنـاوێکی ئەشـرافی بـۆ پیاوماقووڵانی بریتانیا ☰ لُرد

**لۆرد**[٢]: ناوەڵناو. لۆرت؛ بوودە؛ زەنگون؛ زەنگین؛ زۆر دەوڵەمەن و دەسڕۆیشتوو ☰ لُرد

**لۆرک** / lorik/: ناو. ١. لۆر؛ خواردنێکـە لـە شـیر و تیژاوی پەنیر دەکرێ ٢. ئەسـرین؛ فرمێسـک ٣. لایەلایە ☰ ١. لور؛ از لبنیات ٢. اشک ٣. لالایی

**لۆرکـە** / lorke/: نـاو. لۆرکـێ؛ جـۆرە قامێکـە ☰ آهنگی است

**لۆرکێ** / lorkê/: ☜ **لۆرکە**

**لۆرە** / lore/: ناو. لۆر: ١. دەنگی بلـوێر ٢. گـۆرانی بە سەبر ٣. گریان بە دەنگـی گـڕ و لـەرزۆک ٤. قامێکە ☰ ١. آواز نی ٢. ترنُم ٣. گریە با صدای خشن ۴. آهنگی است

**لۆرەپ** / lorep/: نـاو. ئـەو جێگـەی لـە گـوان کـە شیری لێ دێتە دەر ☰ آرئول پستان

**لۆرەلـۆر** / lorelor/: دەنگـەناو. دەنگـی خوێنـدنی لەبەر خۆوە ‹لە بەر خۆیەوە لۆرەلۆریەتی› ☰ صدای ترنُم

**لۆرەلەپ** / lorelep/: ☜ **لۆلەپ**

**لـۆری** / lorî/: نـاو. ١. تەگـەی خـوازراوە؛ نێـری وردەماڵان ٢. ماشـینی بـاری ٣. لایـەلایـە ☰ ١. تگەای کە بە عاریە بە گلەی دیگر برند ٢. کامیون ٣. لالایی

**لۆریاسی** / loryasî/: ☜ **لۆراسی ـ١**

**لۆریانەوە** / loryanewe/: ☜ **لۆرانەوە**

**لۆریلۆری** / lorîlorî/: ☜ **لایەلایە**

**لـۆرین** / lorîn/: نـاو. سـەرکۆنە؛ لۆمـە؛ لۆمـەی؛ سەرزەنشت ☰ سرزنش

**لۆرینەوە** / lorînewe/: ☜ **لۆرانەوە**

**لۆڕک** / lořik/: ☜ **لوڕ**

**لۆزەندەر** / lozender/: ناوەڵناو. زەبەلاحی تـەژە ☰ لندهور

**لۆژ**[١] / loj/: ناو. ١. ڕەوتی بزووتن بـەولاولادا؛ ڕاژان ٢. ☜ **لۆج** ☰ ١. حرکت پاندولی ٢. ☜ **لۆج**

**لۆژ**[٢]: ناوەڵـناو. ١. تەمـەڵ؛ قـوونگـران ٢. تخـێل؛ ڕاکشاو لە درێژەوە ☰ ١. تنبل ٢. دراز بر زمین افتاده

**لۆژان / lojan/**: چاوگ. ١. تخێل بوون؛ لە سەر زەوی درێژ بوون ٢. ڕاژان؛ هاتوچۆ کردن ☰ ١. بر زمین دراز شدن ٢. حرکت کردن پاندولی

**لۆژاندن / lojandin/**: چاوگ. لۆژانن: ١. بە زەویدا تخێل کردن ٢. ڕاژاندن؛ هاتوچۆ پێ کردن ☰ ١. بر زمین دراز کردن ٢. پاندولی حرکت دادن

**لۆژانن / lojanin/**: ☜ **لۆژاندن**

**لۆژلۆژ / lojloj/**: ☜ **لاژ ـ لاژ**

**لۆژە / loje/**: ناو. ١. تەمەڵی؛ قوون‌گرانی ٢. بزاوی بە هەر دووک لای ڕاستە و چەپەدا ☰ ١. تنبلی ٢. نوسان پاندولی

**لۆژەلۆژ / lojeloj/**: ناوەلکار. ١. سەبرە ـ سەبرە ٢. بە لارەولارەوە ☰ ١. سلانە ـ سلانە ٢. یکوَری

**لۆژین / lojîn/**: ناو. لۆدەی گیا و گزرە ☰ تودەی بر هم انباشتەی علوفە

**لۆس[1] / los/**: ناو. ١. گوپ لە ناوی زارەوە ٢. دارێکی ئەستوور کە چەند کەس دەیدەنە بن شتی گران و قورسەوە بۆ هەڵگرتنی ٣. ☜ **لۆسە ـ١** ٤. ☜ **لۆش ـ٢** ٥. فەتیرە؛ نان لە هەویری هەڵنەهاتوو ☰ ١. لُپ از داخل ٢. الوارمانندی کە جسم سنگین را با آن جابجا کنند ٣. ☜ **لۆسە ـ١** ۴. ☜ **لۆش ـ٢** ۵. فطیر

⊡ **لۆس کەسێ بەستن:** *[مەجازی، پلار]* کەسێکی قورس یان تەنبەڵ جووڵاندن ‹ئەوەندەی خواردووە مەگەر لۆسی بوەسن هەڵسێ!› ☰ شخص تنبل یا سنگین را تکان دادن

**لۆس[2]:** ناوەلناو. ١. سواو لە بەر زۆر کار کردن ٢. فێربو؛و عادەت گرتوو ‹لە چەنەبازیدا لۆس بووە!› ٣. *[کینایە]* تەواو لەکارکەوتوو ‹ئیتر لۆس بووم ناتوانم کار بکەم!› ☰ ١. ساییدە شدە از کار زیاد ٢. عادت کردە ٣. از کار افتادە

**لۆستک / lostik/**: ناو. چلپاو؛ قوڕی شل و تراو ☰ لای و لجن

**لۆسۆرە / losore/**: ناو. لۆگەنە؛ گەنەلۆ؛ گیایەکە لە تیرەی گەلادەرزی ئاژەڵ کوێر دەکا ☰ گیاهی برگ سوزنی و سمی

**لۆسە / lose/**: ناو. ١. لایز؛ لۆس؛ لهازە؛ لەوازە؛ لیهازە؛ لێهازە نوێل ٢. دەیلەم؛ باری؛ باریە؛ سلنگ ‹بەفرەکە هێندە ڕەق بوو بە لۆسە کون دەکرا «هێمن»› ☰ ١. اهرُم ٢. دیلم

**لۆسەکە / loseke/**: ناو. گیایەکە بنەکەی دەخورێ ☰ گیاهی با پیاز خوردنی

**لۆسی / losî/**: ناو. ١. سافی؛ دژی زروی ٢. تەڕزوانی ☰ ١. صافی ٢. چربزبانی

**لۆسێ / losê/**: ☜ **لچقەوی**

**لۆش / loş/**: ناو. ١. گیایەکی بۆنخۆشە ٢. فەتیرە؛ لۆس؛ نانێ کە هەویرترشیان لە هەویرەکەی نەدابێ یان پێش لە هەڵاتنی کرابێ ☰ ١. گیاهی خوشبو ٢. فطیر

**لۆشک / loşik/**: ناو. جۆرێ کولێرەی چکۆلە ☰ نوعی گردەنان کوچک

**لۆشکە / loşke/**: ☜ **لەواشە ـ١**

**لۆشمە / loşme/**: ناو. گیایەکە ☰ گیاهی است

**لۆشە / loşe/**: ناو. کولێرەی گەورە ☰ گردەنان بزرگ

**لۆشەکرە / loşekre/**: ناو. گیایەکە ☰ گیاهی است

**لۆغ / loğ/**: ناو. ١. لۆچ؛ توێ ٢. بانگلێر؛ بانگوش ☰ ١. لایە؛ چین ٢. بامغلتان

**لۆغان / loğan/**: ناو. لۆخان؛ بەزم و ئاهەنگ ☰ بزم و سرور

**لۆغانە / loğane/**: ناو. لۆغە؛ بەخشش بە هۆی خەرمان سوور بوون ☰ انعام بە شادی آمادە شدن خرمن

**لۆغە / loğe/**: ناو. ١. لۆغەلۆغە؛ نەخۆشی زمان ئەستوور بوون ٢. ☜ **لۆغانە** ☰ ١. بیماری ورم زبان ٢. ☜ **لۆغانە**

**لۆغەت** / loğet/: ناو. دەنگۆ؛ شاتوشووتی لە ڕاستی بەدوور ☰ شایعه

**لۆغەلۆغە** / loğeloğe/: ☜ **لۆغە ـ١**

**لۆڤک** / lovik/: ☜ **لۆبیا**

**لۆڤە** / love/: ناو. هەوڵ؛ تەقالا ☰ تلاش

⊡ **لۆڤە کرن:** هەوڵ دان ‹ژ بۆ ئەو کارە گەلەک لۆڤە کرن› ☰ تلاش کردن

**لۆق**[1] / loq/: ناو. ١. لاق؛ لنگ ‹ئەم کابرا لۆق درێژە کێ بوو؟› ٢. گاف؛ هەنگاو ٣. لە ئەژنۆ بەرە ژێر ٤. لەق؛ هێلکەی گەنیو ٥. ☜ **لۆقە**[1] ٦. قنەی باڵدار ٧. تۆڵا؛ قورسە؛ کولۆی ساف لە کانزا ٨. کولێرە ٩. لەقە؛ کاری لێ دان بە پا ☰ ١. لنگ ٢. گام ٣. از زانو به پایین ۴. تخم‌مرغ گندیده ۵. ☜ **لۆقه**[1] ۶. عمل راه رفتن پرنده ۷. شِمش ۸. نان گرده ۹. لگد

⊡ **لۆق هاویشتن:** گاڤی درێژ ڕۆیشتن؛ شەقاو هاویشتن ☰ گام بلند برداشتن

**لۆق هەڵێنان:** شەقاو/ هەنگاو نان ☰ گام برداشتن

**لۆق هەڵێنانەوە:** شەقاو هاویشتن؛ هەنگاو هەڵێنان ☰ گام برداشتن

**لۆق**[2]: ئاوەڵناو. ١. نائاسایی ٢. درێژی پێنەکەوتوو ☰ ١. غیرعادی ٢. دراز بی‌قواره

**لۆق**[3]: پێرۆ. ← **لەق‌ولۆق ـ تاق‌ولۆق**

**لۆقاندن** / loqandin/: چاوگ. تێنەپەڕ. تێپەڕ. //لۆقاندت؛ دەلۆقێنی؛ بلۆقێنە// ◻ تێنەپەڕ. لۆقانن؛ لۆقە کردن: ١. بە قۆرتە ڕۆیشتن ◻ تێپەڕ. ٢. لۆقە پێ کردن ☰ ١. هروله کردن ٢. به هروله انداختن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەلۆقاندن

**لۆقانن** / loqanin/: ☜ **لۆقاندن**

**لۆقاو** / loqaw/: ناو. گاف؛ هەنگاو ☰ گام

**لۆقژین** / loqjîn/: چاوگ. دەرپەڕینی لەپڕ ☰ جهیدن ناگهانی

**لۆقلۆق** / loqloq/: ئاوەڵناو. ١. بێئاوەز و نازیرەک ٢. تەپ (بۆ یەکسم) ☰ ١. کودَن ٢. تنبل (باربر)

**لۆقلۆقی** / loqloqî/: ئاوەڵناو. لۆقی: ١. لنگ‌درێژ ٢. گاف‌گوشاد ☰ ١. لنگ دراز ٢. گام‌فراخ

**لۆقنایەڤە** / loqnayeve/: چاوگ. زۆر گەڕاندن و کاری زۆر پێ کردن ☰ کار زیاد کشیدن

**لۆقە**[1] / loqe/: ناو. لۆق؛ لەقلۆق؛ قۆرتە؛ قۆترە؛ قەترە؛ گورگەلۆقە؛ ڕەفتی لەسەرخۆ و بە نەرمە ☰ هروله؛ نیمدو

⊡ **لۆقە کردن:** ☜ **لۆقاندن**

**لۆقە**[2]: ئاوەڵکار. جاروبار؛ بەدەگمەن ☰ به نُدرت

**لۆقەلۆق** / loqeloq/: ئاوەڵکار. ١. کاری بە قۆرتە ڕۆیشتن ‹بە لۆقەلۆق خۆم گەیاندە ماڵێ› ٢. دۆخی بەڕێوە ڕۆیشتنی درێژی پێنەکەوتوو ‹لۆقەلۆق شەقامەکانی گەز کرد› ☰ ١. عمل هروله/ نیمدو رفتن ٢. حالت راه رفتن دراز بی‌قواره

**لۆقی** / loqî/: ☜ **لۆقلۆقی**

**لۆقین** / loqîn/: چاوگ. بە پەلە و لۆقەلۆق ڕۆیشتن ☰ با شتاب رفتن

**لۆک** / lok/: ناو. ١. یەکێک لە ڕەگەزەکانی وشتر ٢. حوشتری نێر ٣. *[مەجاز]* ئازا و نەترس ٤. کاری ڕێک گوشین و گلۆفین ٥. چۆنیەتی داخران و مۆر کران ٦. تۆڵا؛ قورسە؛ کولۆی ساف لە کانزا ٧. قەترە؛ تکە؛ تنۆک ٨. ☜ **لۆکە**[1] ☰ ١. نژادی از شتر ٢. شتر نر ٣. شُجاع ۴. عمل در آغوش فشُردن ۵. لاک‌ومُهر ۶. شمش ۷. قطره ۸. ☜ **لۆکە**[1]

⊡ **لۆک کردن:** داخستن و مۆر کردن ☰ لاک‌ومُهر کردن

**لۆکاندن** / lokandin/: چاوگ. ١. گەمە کردن و یەکتر تلاندنەوە ٢. *[کینایە، شوورەیی]* سەرجێیی کردن ٣. لۆقاندن؛ غاراندن ☰ ١. لاسیدن ٢. همخوابگی کردن ٣. به تاخت راندن

**لۆکچە** / lokçe/: ناو. وشتری نێری سێ بەهاردیتوو

▤ شتر نر سه‌ساله

**لۆکم** / lokim/: ناو. شمش؛ که‌سته‌ک؛ شیش ▤ شمش

**لۆکه**[1] / loke/: ناو. لۆک؛ لووکه؛ په‌مۆ؛ په‌موو؛ په‌مگ؛ په‌مبۆ؛ په‌نبۆ؛ په‌نبی؛ په‌مبی؛ په‌مه؛ په‌مپه؛ ورٍ؛ وره: ١. گیای لۆکه؛ پووشی په‌موو ٢. تاڵ و ڕیشاڵی (زۆرتر سپی) وه‌ک خوری، به‌رهه‌می گیای لۆکه ‹که‌ی ده‌بێ جه‌معییه‌تی خاتر له بۆم/ تا وجوودم لۆکه بێت و غه‌م هه‌لاج «ناری»› ▤ ١و٢. پنبه

**.لۆکه**[2]: پاشگر. ـلۆکه؛ ـلووکه؛ ـ لووکه؛ بۆ چووک شاندان ‹بۆره‌لۆکه؛ ته‌رزه‌لۆکه› ▤ پسوند تصغیر

**لۆکه‌کێوی** / lokekêwî/: ☜ **که‌تان**[2]ـ١

**لۆکه‌مێشکه** / lokemêşke/: ناو. ناوی گیایه‌که، بستێک به‌رز ده‌بێ و پاش وه‌رینی گوڵه‌که‌ی شتێکی وه‌ک لۆکه ده‌ر ده‌کا ▤ گیاهی است

**لۆکی** / lokî/: ☜ **لاکی**

**لۆگۆ** / logo/: ناو. نیشانه؛ ئارم ▤ آرم

**لۆگه‌نه** / logene/: ☜ **لۆسۆره**

**لۆلاق** / lolaq/: ☜ **لولاق**

**لۆلاو** / lolaw/: ☜ **لاولاو**

**لۆلک** / lolik/: ناو. بووده‌ڵه؛ کووده‌ڵه؛ به‌چکه‌ی ورچ و به‌راز ▤ بچه‌ی خرس و گُراز

**لۆلکه** / lolke/: ناو. ١. ☜ **لولکه** ٢. وشکه‌ڵوا، که بۆ سه‌فه‌ر لێ ده‌نرێ ▤ ١. ☜ **لولکه** ٢. نوعی حلوای سفری

**لۆلکه‌سپی** / lolkes(i)pî/: ناو. وشکه‌هه‌ڵوای له ئارد و شه‌کر ▤ نوعی حلوا از آرد و شکر

**لۆلکه‌سۆر** / lolkesor/: ناو. وشکه‌هه‌ڵوای له ئارد و دۆشاو ▤ نوعی حلوا از آرد و شیره‌ی انگور

**لۆلۆ**[1] / lolo/: ناو. هه‌لاله؛ گیایه‌کی بۆنخۆشه ▤ آلاله

**لۆلۆ**[2]: ناوه‌ڵناو. چین له سه‌ر چین؛ توێ له سه‌ر توێ ‹به‌ستی له پشتی پشتێنی لۆلۆ/ دای به سه‌ر منا له‌رز و سێبه‌ڕۆ «فولکلۆر»› ▤ چین-چین

**لۆله‌پ** / lolep/: ناو. لۆره‌له‌پ؛ لۆله‌په؛ داری لووسی گرۆڤه‌ر بۆ پێش و دواوه‌ی مه‌شکه که داردۆژنگی به زمانه تێ خراوه ▤ چوب دستگیره‌ی مشک به هم زدن

**لۆله‌په** / lolepe/: ناو. ١. ☜ **لۆله‌پ** ٢. چه‌رخی ئاو کێشان ▤ ١. ☜ **لۆله‌پ** ٢. چرخ آبکشی

**لۆم** / lom/: ناو. ١. ☜ **لۆمه** ٢. نێڵ؛ مه‌ڵغه ▤ ١. ☜ **لۆمه** ٢. اهرم

**لۆمه** / lome/: ناو. لۆم؛ له‌وم؛ لۆمه‌ی؛ لوومه‌ی؛ لۆرین؛ سه‌رکۆنه ‹مه‌که‌ن لۆمه‌ی په‌شێویی دڵ که ئه‌مشه‌و/ په‌شێواوه له به‌ر په‌رچه‌م‌په‌شێوان «نالی»› ▤ سرزنش

**لۆمه‌ی** / lomey/: ☜ **لۆمه**

**لۆن** / lon/: ناو. ١. له‌ون؛ جۆر؛ ته‌رح ‹به‌و لۆنه‌ی تۆ ده‌ته‌وێ ده‌س نادا› ٢. زه‌لکاو؛ زۆنگ ٣. که‌وڵ؛ پێسته ▤ ١. طور ٢. باتلاق ٣. پوست حیوان

**لۆنگ** / long/: ناو. ١. فۆته ٢. که‌وڵی ڕایه‌خ ‹تۆ لۆنگ مه‌جنوون وستی وه شانه‌م/ تۆ ده‌سته‌ی ئایر وه‌ر دای وه یانه‌م «بێسارانی»› ▤ ١. لُنگ حمام ٢. پوستین زیرانداز

**. لۆنه** / lone/: پاشگر. تا؛ تاڵ؛ داو ‹به به‌نی دوولۆنه بیدروو!› ▤ ـ لا

**لۆوک** / lowik/: ☜ **لۆبیا**

**لۆیه**[1] / loye/: ناو. توێ؛ توێژ ▤ لایه

**لۆیه**[2]: ناوه‌ڵکار. ١. له به‌ر ئه‌وه ‹لۆیه هاتم بتبینم› ٢. بۆیه؛ جوابی پرسیار ‹لۆ وات کرد؟ لۆیه› ▤ ١. به این دلیل ٢. همین‌طوری

**لۆیی** / loyî/: ناو. په‌رده‌ی ده‌رگای خێوه‌ت ▤ پرده‌ی درب خیمه

**لوو**[1] / lû/: ناو. ١. لک؛ لۆ؛ گرێ و خڕایی سه‌خت له بن پێست ٢. ☜ **لیو** ٣. ☜ **لویه** ▤ ١. غُده

٢. ☜ لێو ٣. ☜ لویە

**- لو**[٢]: پاشگر. سەر بە؛ لایەن ‹زەعفەرانلوو؛ حەیدەرانلوو› ☰ -لو

**لوبلوب** / lûblûb/: ناو. سووری لە سەر شتێ ☰ اصرار؛ ابرام

**لوبی** / lûbî/: ☜ لۆبیا

**لوبیا** / lûbya/: ☜ لۆبیا

◙ **لوبیا چیتی**: ☜ لۆبیا شلّە

**لوبیە** / lûb(i)ye/: ☜ لۆبیا

**لوپژەن** / lûpjen/: ناو. هەللاج؛ هەلاج ☰ حلاج

**لووت**[١] / lût/: ناو. لووتە؛ لیت؛ پت؛ پەت؛ کەپۆ؛ کەپوو؛ کەپ؛ کەپووگە؛ کەپی؛ کەپۆڵک؛ کاپۆ؛ کەپۆڵ؛ کاپۆڵ؛ کەپووی؛ کاپۆڵک؛ دەماخ؛ دم؛ فرنک؛ تفنک؛ بێڤل؛ بەڤل؛ دڤن؛ دەڤن؛ دفن؛ دەفن؛ پۆز؛ نووک؛ تونک؛ زنڕ؛ نوفت؛ خرناق؛ خڕناک؛ ئەندامی زۆپی لە ناوەڕاستی دەموچاو کە کاری هەناسە دان و بۆن بیستنە ☰ بینی

◙ **لووت نەسترین**: کەپۆ خاوێن کردنەوە ☰ بینی ستُردن

**لووت با دان**: /کینایە/ نارازی بوون ☰ ناراضی بودن

**لووت بە بەر خۆدا هاتنەوە**: ☜ لووت بە خۆدا هاتنەوە

**لووت بە خۆدا هاتنەوە**: /مەجاز/ لووت بە بەر خۆدا هاتنەوە؛ خەجاڵەت و پەشیمان بوونەوە ☰ خجالت کشیدن و پشیمان شدن

**لووت بە لووتەوە تەقین**: /کینایە/ لەپڕ تووش یەکتر بوون ☰ ناگهان به هم برخورد کَردن

**لووت پروانن**: /کینایە/ ناڕاحەت کردن ☰ رنجیده خاطر کردن

**لووت پژان**: خوێن بەر بوونی کەپۆ ☰ خون دماغ شدن

**لووت پیا نەهاوردن**: ☜ لووت پێدا نەهێنان

**لووت پێدا نەهێنان**: /کینایە/ لووت پیا نەهاوردن؛ ئاوڕ لێ نەدانەوە؛ بایەخ پێ نەدان ☰ توجه نکردن؛ ارج ننهادن

**لووت چوزانەوە**: لووت چووزیانەوە : ١. کەپۆ سووزیانەوە ٢. /مەجاز/ لە هومێدەوارییەوە بە سەر ناهومێدیدا کەوتن ☰ ١. احساس سوزش داشتن در بینی ٢. دماغ سوخته شدن

**لووت چوزیانەوە**: ☜ لووت چوزانەوە

**لووت خوریان**: ☜ لووت لێخوران

**لووت خوساندن**: /مەجاز/ دڵنیا کردن ☰ خاطرجمع کردن

**لووت داژاندن**: ☜ لووت داژەندن

**لووت داژەندن**: /کینایە/ لووت داژاندن؛ لووت داژەنین؛ سەر دە بەر خۆنان بە ناڕەحەتی و خەمباری ☰ سر افکندن و کز کردن

**لووت داژەنین**: ☜ لووت داژەندن

**لووت ڕاسان**: خوێنی لووت بەر بوون ☰ خون‌دماغ شدن

**لووت ڕەق بوون**: /مەجاز/ قسە پێ نەمان و شەرمەزار بوون ‹کە پارەکەیان لە گیرفانی براکەی دەرهێنا، لووتی ڕەق بوو› ☰ شرمنده شدن

**لووت زانەوە**: ئاو لە کەپۆ هاتن ☰ آب از بینی سرازیر شدن

**لووت سۆڵانەوە**: لووت سۆڵیانەوە: ١. لووت سووزیانەوە ٢. کەپۆ بەرز کردنەوەی بارگین و نێرەکەر لە بۆن کردنی تەرس ☰ ١. احساس سوزش داشتن در بینی ٢. بینی بلند کردن اسب و الاغ از بو کردن فضلەی مادە

**لووت سۆڵیانەوە**: ☜ لووت سۆڵانەوە

**لووت شکان**: /کینایە/ ١. ناهومێد بوون ٢. خەجاڵەت بوون ☰ ١. ناامید شدن ٢. شرمندە شدن

**لووت شکاندن**: /کینایە/ لووت شکانن: ١. تەمێ کردن ٢. ناهومێد کردن ☰ ١. تنبیە کردن ٢.

ناامید کردن

**لووت شکانن:** ☜ **لووت شکاندن**

**لووت گرتن:** ١. دەس بە کەپۆوە گرتن لە بۆگەن ٢. *[کینایە]* لالووت بوون ☰ ١. بینی گرفتن از بوی بد ٢. ناخشنود بودن

**لووت گیران:** لووت گیریان/ کپ بوون؛ ئالامەت گرتن ☰ احتقان بینی از زُکام

**لووت گیریان:** ☜ **لووت گیران**

**لووت لاگرتن:** لالووت بوون ☰ ناخشنود بودن

**لووت لێ خوران:** *[مەجاز]* لووت خوریان؛ خەیال کردن و بە تەما بوون ☰ هوس کردن

**لووت هاتنە خوارەوە:** ١. لووت شکان ٢. *[مەجاز]* واز لە فیز هێنان ☰ ١. تنبیه شدن ٢. از تکبُر دست کشیدن

**لووت هەڵقرچاندن:** *[کینایە]* تووڕەیی نیشان دان ☰ اظهار تنفر کردن

**لووت هەڵکردن:** لا لووتی شان دان؛ لالووت بوون ☰ ناخشنود بودن

**لووت هەڵمساندن:** *[کینایە]* پیش خواردنەوە و تووڕە بوون ☰ عصبانی شدن و بُغض کردن

**لووت**[٢]: ناوەڵناو. لوت؛ ڕووت ☰ لُخت

**لووت**[٣]: پێرۆ. ← **لاتولووت**

**لووتاوێژ**[١] / lûtawêj/: ناو. بۆگەنی زۆر پیس (کە مرۆ کەپۆی دەگرێ نەیبیسێ) ☰ بوی بسیار بد

**لووتاوێژ**[٢]: ناوەڵناو. دژخۆراک؛ بێزکەر لە خواردن ☰ بدخوراک

**لووتبڕاو** / lûtb(i)řaw/: ناوەڵناو. لووتبڕیاگ: ١. تایبەتمەندی کەسێ کە لە سەر کاری خراپ سەری بێقلیان بڕیوە ٢. *[کینایە]* ئابڕووتکاو ☰ ١. بینی بُریده ٢. رسوا

**لووتبڕیاگ** / lûtbiřyag/: ☜ **لووتبڕاو**

**لووتبڵند** / lûtb(i)łind/: ☜ **لووتبەرز**

**لووتبەرانی** / lûtberanî/: ناوەڵناو. *[پلار]* خاوەن لووتی زل و زۆپ و نەپۆڕ ☰ دارای بینی بزرگ و برجسته

**لووتبەرز** / lûtberz/: ناوەڵناو. *[پلار]* لووتبڵند؛ بەفیز؛ بەدەعیە ☰ متکبر

**لووتبەرزی** / lûtberzî/: ناو. *[پلار]* فیز؛ دەعیە ‹بە فیزەوە ڕوو لە خەڵک وەرمەگێڕە! بە لووتبەرزی لەڕێ مەڕۆ! «هەژار، *قورئان*»› ☰ تکبُر

**لووتپان**[١] / lûtpan/: ناو. غەلوخەدەنووک؛ قەلوخەدەنووک؛ جۆرێک مراوی دەندووک پانە بە درێژایی نزیک ٥٠ سانتیمیتر، نێرەی پشتی ڕەش و خاڵخاڵ، سەری شین، تەنیشت و بەر زگی خەنەیی و سینگی سپییە، مێوینەی لە بۆرەسۆنە دەچێ و تەنیا سەر شانی شینە، لە بەنداو و زەلکاواندا دەژین ☰ نوک‌پهن

**لووتپان**[٢]: ناوەڵناو. کەپۆپان؛ لووتدافسیاگ ☰ دماغ‌کوفته‌ای

**لووتخوار** / lûtx(i)war/: ناوەڵناو. *[مەجاز]* قەڵس؛ تووڕە؛ ناڕازی ☰ قهرکرده؛ ناراضی

**لووتدافسیاگ** / lûtdafisyag/: ناوەڵناو. لووتپان ☰ بینی‌پهن

**لووتدرێژ** / lûtd(i)rêj/: ناوەڵناو. خاوەن لووتی لە ئەندازە بەدەر درێژ ☰ بینی‌دراز

**لووتڕەوان** / lûtřewan/: ناوەڵناو. *[مەجاز]* ڕووقایم و فێڵباز ☰ شیّاد و پُررو

**لووتزل** / lûtzil/: ناوەڵناو. ١. کەپۆزەلام ٢. *[کینایە]* لووتبەرز؛ فیسن ☰ ١. دماغ‌گنده ٢. مُتکبر

**لووتشۆڕ** / lûtşoř/: ناوەڵناو. ١. لووتدرێژ ٢. *[کینایە]* چلمن؛ چلم لە لووت داشۆڕاو ☰ ١. دراز بینی ٢. خلمو

**لووتک** / lûtik/: ناو. قەمتەرە ☰ پُل ناودانی

**لووتکە** / lûtke/: ناو. ١. ترۆپک ‹لە ژێر ئاسمانی شینا/ لە پاڵ لووتکەی بەفرینا/ کوردستان گەڕام/ دۆلاودۆڵ پێوام «گۆران»› ٢. کەپک ☰ ١. قُلە ٢.

دماغه

**لووتوبزووت** / lût û b(i)zût/: ئاوەڵکار. لەپڕ و ناکاو ‹لووتوبزووت تووشی بووم› ☰ ناگهان؛ ناگاه

**لووتوپووت**[1] / lût û pût/: ناو. لووتەلووت؛ بۆڵەوپرتە؛ پرتەوبۆڵە ☰ غرولند

**لووتوپووت**[2]: ئاوەڵناو. زۆر ڕووت و نەدار ☰ فقیر ژندەپوش

**لووتە**[1] / lûte/: ناو. ١. پێشکۆ؛ کەپک ٢. لووتکە؛ ترۆپکی چیا ٣. ژنی بە ناز و شەرمێون ☰ ١. دماغه ٢. قُله ٣. زن طناز و خجالتی

**لووتە**[2]: ئاوەڵناو. ١. لووتزل؛ کەپۆزل ٢. [کینایە] ڕووتەکە و پووتەکە ☰ ١. دماغ‌گنده ٢. کوچک بی‌نمود

**لووتەلا** / lûtela/: ☜ لالووت

**لووتەلووت** / lûtelût/: ناو. لووت‌وپووت؛ پرتەوبۆڵە ‹دایمە لووتەلووتیە، نازانم چەی گەرەکە› ☰ غرولند

**لووتەوانە** / lûtewane/: ناو. ١. خەزێم؛ ئاڵقەی نێوان کونەلووت بۆ جوانی ٢. سەردەرانەی زەق ☰ ١. گُل بینی ٢. آستانەی برآمدەی در

**لووتیتیوم** / lûtîtyum/: ناو. لووتیسیوم؛ توخمی کیمیایی کانزایی لە ئاخری ڕیزی لانتانیدەکان، بە ژمارەی ئەتومی ٧١ و کێشی ئەتومی١٧٤,٩٧ ☰ لوتتیُم؛ لوتسیُم

**لووتیسیوم** / lûtîsyum/: ☜ لووتیتیوم

**لووجن** / lûcin/: ناو. دووکەڵ‌کێش ☰ دودآهنج

**لووچکاندن** / lûçkandin/: چاوگ. جاوین؛ جوون ☰ جویدن

**لووچین** / lûçîn/: چاوگ. جووڵان (کلک) ☰ جُنبیدن (دُم)

**لوودە** / lûde/: ناو. کادێن؛ کادان ☰ کاهدان

**لوور**[1] / lûr/: ناو. ڕەوتی بە تەوژم سەرەوژێر هاتنی باڵداری ڕاوکەر ☰ شیرجەی پرندەی شکاری

**لوور**[2]: ئاوەڵناو. ١. ڕاست و تەخت ٢. پێچدراو؛ تابدار ☰ ١. راست و هموار ٢. پیچ‌خورده

⊡ **لوور کردن**: پێچ دان ☰ پیچیدن؛ تاب دادن

**لوور**[3]: دەنگەناو. ١. حەپەی درێژی سەگ و گورگ و چەقەڵ ٢. دەنگ و ئاهەنگی بلوێر ☰ ١. زوزه ٢. آواز نی‌لبک

**لووراندن** / lûrandin/: چاوگ. تێنەپەڕ. //لوورانـدت؛ دەلـوورێنی؛ بلوورێنـە// لۆراندنـەوە؛ لیرانـدن: ١. دەنـگ دەرهێنـانی وەک سـەگ و گـورگ بـە درێژی ٢. هـاژە کـردنی گێـژاوی بەتـەوژم ☰ ١. زوزه کشیدن ٢. غُریدن گرداب

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: -/ چاوگی نەرێنی: نەلووراندن

**لوورکنایش** / lurk(i)nayîş/: چـاوگ. لایلایـی کردن ☰ لالایی خواندن

**لوورنای** / lûrnay/: چاوگ. لووراندن ☰ غُریدن

**لوورە** / lûre/: دەنگەناو. لـیرە؛ لـوورە؛ دەنگـی لووراندن ‹لوورەی گورگ› ☰ زوزه

⊡ **لوورە هاتن**: دەنگی وەک لوورە لێوە هاتن ‹پیرە گێژاو لوورەی دێ!› ☰ غُریدن

**لوورەلوور** / lûrelûr/: دەنگەناو. لـوورەی بـە شـوێن یەکدا ☰ زوزەی پیاپی

**لووری** / lûrî/: ناو. لای‌لای ☰ لالای بچه

**لووریایوە** / lûryaywe/: چـاوگ. لـوورە کـردن ☰ زوزه کشیدن

**لووری.لووری** / lûrî lûrî/: ناو. لایەلایە ☰ لایی‌لایی

**لووڕ** / lûř/: ناو. لـویر؛ لـۆڕک؛ لـوێر؛ ژاڵـە؛ ڕووڵ؛ لووڕک؛ ڕوولک ☰ خرزهره

**لووڕک** / lûřik/: ☜ لووڕ

**لووزەتێن** / lûzetên/: ناو. تینـگ؛ ئاڵـوو؛ بادامـەی لای مل ☰ لوزتین

**لووزەو** / lûzew/: نـاو. ١. چۆنیـەتی بەربوونـەوە و خزینی شتی ورد بە پرایی ‹جەواڵـەکە درا، گـەنم لووزەوی کرد› ٢. ڕەوتی دەرچوونی تراو لە کون و قەڵشت بە تەوژمەوە ‹وەرە مەیگێڕ دەمەوێ ئەوشۆ

خەمی دڵ کەم کەم/ لووزەوم بەردە سەرێ! نامــەوێ جورعــەی کــەم ــکــەم «هــێمن»› ٣. قەڵــتوبــڕ؛ کارەسـاتی دابــەڕزانی سـپایانی دژمــن، وێــڕای کوشتوبــڕ و تــاڵان ‹لــووزەوی هەوەڵــین دەسـتە سوارانی داگیرکەرانی کوردستان، ئۆغریان لێ بڕیمەوە و بەرپەرچیان دامــەوە «هــەژار، شـەرەفنامە»› ☰ ١. ریزش پیاپی دانەها ٢. ریزش مایع با فشار ٣. ایلغار

**لــووس**[١] / lûs/: نـاو. ١. پلـوور؛ پلووسـک ٢. تـاف؛ تاڤگە ٣. دەزگای ڕۆن لە ڕوەک گرتن ٤. لـیس؛ جێ هەڵنیشتنی مریشـک و بۆقلـە ٥. گیایـەکی پاپایا، گەڵاساف و پـان و درێـژە، بـە سـەلکێکی وەک سەلکی سـیرەوە، بـۆ دەرمـان دەبـێ ☰ ١. ناودان ٢. آبشار ٣. دستگاه روغن‌کشی ۴. جـای روی تخم نشستن مرغ و بوقلمون ۵. گیاهی است

**لــووس**[٢]: ئاوەڵـناو. ١. سـاف: *ئـا)* بـێ‌گیـا ‹دەشـتی لووس› *ب)* بـێ‌مـوو ‹سـەری لـووس› ٢. حـولی؛ بێ‌گرێ و زبری ‹بەردی لووس› ٣. *[کینایە]* جـوان ‹ژنێکی لووسە› ٤. تەڕزوانی خۆڕیک‌خەر ‹بەسـیە چیتــر خــۆ لــووس مەکــە!› ٥. *[ناشـیرین]* بەپشـت؛ قووندەر ☰ ١. صاف: *الف)* بی‌گیاه *ب)* بی‌مو ٢. لَخت؛ صاف بدون گره و زبری ٣. زیباروی ۴. چرب‌زبـان ۵. کونی

⊡ **لووس بوون**: ١. ساف بوون؛ سوان لە بەر کـاری زۆر ٢. لاڕێ بوون ٣. لە کـار کـەوتن لـە بـەر ماندوویی ☰ ١. صاف شدن ٢. بدعادت شدن ٣. از کار افتادن از فرط خستگی

**لووساو** / lûsaw/: ☜ **لووساوک**

**لووسـاوک** / lûsawik/: نـاو. لووســاو: ١. ســوول؛ پلووسک ‹ئەوەی هەر دەستی لـە لـووتی داوە/ وتی فیل وەکوو لووساوکی ئاوە! «هەژار، *بـۆ کوردسـتان*»› ٢. سولاڤ؛ تاڤگە ☰ ١. ناودان ٢. آبشار

**لووستر** / lûstir/: ناو. چلچـرا؛ قەنـدیل؛ چـرای بـە چەن گلۆپەی لە میچەوە هەڵواسراو ☰ لوستر

**لووسکار** / lûskar/: نـاو. کەسێ کە شتی زبر سـاف دەکا ☰ صافکار

**لووسکە** / lûske/: نـاو. ١. لاوی دەمــڕووت ‹هێنـد سادە و لووسکە نۆکەری بوو/ ژوور و دەری هەر پـڕی پەری بوو «هەژار، *مەم و زیـن*»› ٢. *[کینایە، ناشـیرین]* لاوی حیز ☰ ١. جوان بی‌مو ٢. بچەکونی

**لووسکەباز** / lûskebaz/: ئاوەڵناو. *[ناشـیرین]* بەچەباز. هەروەها: **لووسکەبازی** ☰ بچەباز

**لــووس‌لووسـک** / lûslûsik/: نــاو. شــین‌شــینک، زەردەقــوڕە؛ جــۆرێ مارمێلکــەی درێــژ ☰ آفتاب‌پرست

**لووس‌وپووس** / lûs û pûs/: ئاوەڵناو. ١. تەواو لووس؛ بێ‌هیچ زبری ٢. *[کینایە]* دەس‌بەتاڵ؛ دەس‌خاڵـی؛ هیچ پێ نەماو ‹بنـوارە بـوونی ئەووەڵـت و چـوونی ئــاخرت:/ هــاتی چ ڕووت و قــووت و، هــەڵاتی چ لووس‌وپووس! «نالی»› ☰ ١. کاملاً صاف بدون زبری ٢. دست‌خالی

**لووسی** / lûsî/: ناو. ١. چۆنیەتی سـاف و بـێ‌گـرێ بوون ٢. تەڕزوانی ☰ ١. صافی ٢. چرب‌زبانی

**لووسێمی** / lûsêmî/: نـاو. شـێرپەنجەی خـوێن ☰ سرطان خون

**لــووش**[١] / lûş/: نـاو. لووشــە؛ ڕەوتی قــووت دان بــە ساغی ‹لووشی کرد› ☰ بلع

⊡ **لووش کردن**: قووت دان بە ساخی ☰ بلعیدن

**لووش**[٢]: دەنگەناو. ١. دەنگی هەڵمژین و قووت دان ٢. دەنگی لووتی چڵمن ٣. دەنگی دەم و لـووتی یەکسم لە تاسـەی جـۆ ☰ ١. صـدای برکشـیدن و بلعیدن ٢. صدای بینی خلمی ٣. صدای بینی چهارپای در آرزوی علیق

**. لووش**[٣]: پاشەوشە. ـ مژ ‹هەڵلووش› ☰ ـ مک

**لووشاو** / lûşaw/: ☜ **لافاو**

**لووشای** / lûşay/: چاوگ. بە کـەپۆ هەڵـمژین ☰ از بینی برکشیدن

**لووشک** / lûşk/: ناو. جووتە؛ جفتە؛ جۆحتک 🇮🇷 لگدپرانی چهارپا

**لووشکاوێژ** / lûşkawêj/: ☜ **لووشکەهاوێژ**

**لووشکە**[1] / lûşke/: ناو. لووشک؛ جووتە 🇮🇷 لگدپرانی

**لووشکە**[2]: دەنگەناو. پرمە و بۆڵەی یەکسم بۆ ئالیک 🇮🇷 لندیدن چهارپا برای علیق

**لووشکەهاوێژ** / lûşkehawêj/: ناو. لووشکاوێژ؛ لەقەهاوێژ؛ جووتەوەشێن 🇮🇷 جُفتک‌انداز

**لووشنای** / lûşnay/: چاوگ. کفاندن؛ وەک مار دەنگ کردن 🇮🇷 صدای مار درآوردن

**لووشە** / lûşe/: ناو. ١. ڕەوتی قووت دانی بە ساغی ٢. لوویشک؛ گیایەکە دە ناو دۆکلیوی دەکەن ٣. جۆرێ نەخۆشی یەکسم و ڕەشەوڵاغ 🇮🇷 ١. فرایند درسته بلعیدن ٢. گیاهی آشی ٣. از بیماری‌های ستور و چارپایان

**لووشەگورگە** / lûşegurge/: ناو. گیایەکە 🇮🇷 گیاهی است

**لووشەلووش** / lûşelûş/: دەنگەناو. ١. لووشەی زۆری یەکسم ٢. دەنگی هەڵکێشانی پەیتا ـ پەیتای لووت ‹لووتی ناسترێ، هەر لووشەلووشیەتی!› 🇮🇷 ١. صدای لندیدن پیاپی ستور ٢. صدای بالا کشیدن پیاپی بینی

**لووشی** / lûşî/: ناو. هێشوو؛ هۆشە 🇮🇷 خوشه

**لووشیای** / lûşyay/: چاوگ. هەڵلووشران 🇮🇷 سرکشیده شدن

**لووشین** / lûşîn/: چاوگ. ١. قووت دان بە ساغی ٢. لووشە کردنی یەکسم 🇮🇷 ١. درسته بلعیدن ٢. لندیدن ستور

**لووکس** / lûks/: ئاوەڵناو. شیک؛ بەشکۆ؛ لەبار ‹ماڵی لووکس› 🇮🇷 لوکس

**لووکە**[1] / lûke/: ☜ **لۆکە**

ـ **لووکە**[2]: پاشگر. ـ لۆکە؛ ـ لۆکە؛ نیشانەی گچکەیی ‹تەرزەلووکە› 🇮🇷 پسوند تصغیر

**لووگی** / lûgî/: ئاوەڵناو. بەرهەڵدای بێکارە 🇮🇷 ولگرد

**لوول**[1] / lûl/: ناو. ١. لووری باڵدار ٢. پەیوەند لە دار ٣. لوولە ‹لوولێک ترياک› 🇮🇷 ١. شیرجەی پرندە ٢. پیوند درختی ٣. لول

**لوول**[2]: ئاوەڵناو. ١. بادراو؛ لوور ‹قژی لوول› ٢. مەس؛ سەرخۆش 🇮🇷 ١. فر؛ تابداده ٢. مست

⊡ **لوول بوون**: بوونە لوولە؛ بە شێوەی لوولە دەرهاتن 🇮🇷 لوله شدن

**لوول دان**: ١. پێچدان؛ پێچاندنەوە ‹من لە قەرەداغ تۆ لە زمناکۆ/ خۆت لوول دا هاتی خستمت لە گۆ «فولکلۆر»› ٢. *[کنایە]* بە پەلە خواردن 🇮🇷 ١. نوردیدن ٢. با شتاب خوردن

**لوول کردن**: لوولە کردن؛ نواڵە کردن 🇮🇷 لوله کردن

ـ **لوول**[3]: پاشوشە. فرفری؛ پێچراو ‹زوڵفلوول؛ گەلالوول؛ گەردەلوول› 🇮🇷 فر؛ تابداده

**لوولا** / lûla/: ☜ **لوولە**[1]

**لوولاق** / lûlaq/: ناو. لووولاک؛ لۆلاق؛ گاللۆر؛ پێشەی بەلەک 🇮🇷 استخوان ساق

**لوولاک** / lûlak/: ☜ **لوولاق**

**لوولان** / lûlan/: چاوگ. ١. پێچ خواردن ٢. پێچ دان 🇮🇷 ١. پیچ خوردن ٢. پیچ دادن

**لوولپەڕ** / lûlpeř/: ☜ **لیلووپەڕ**

**لوولدراو** / lûld(i)raw/: ئاوەڵناو. پێچدراو؛ پێچراو 🇮🇷 پیچ‌خورده

**لوولک** / lûlik/: ناو. ١. بلوێر ٢. ئامرازێکی جۆلایی ٣. دەمی درێژی مسینە ٤. قرقرە؛ غەرغەرە ٥. ژاڵە؛ لووڕک 🇮🇷 ١. نی‌لبک ٢. ابزاری در دستگاه بافندگی ٣. لوله‌ی آفتابه ۴. قرقره ۵. خرزهره

**لوولکژەن** / lûlikjen/: ☜ **لوولەژەن**

**لوولکە** / lûlke/: ناو. لۆلکە؛ لوولکی جۆلایی 🇮🇷 از ابزارهای بافندگی

**لوولوو** / lûlû/: ناو. ١. لیلوو؛ مرواری؛ گەوهەرێکە

له ناو سەدەف لە دەریا دەس دەکەوێ ‹شەکەر زوبانێ، غونچە دەهانێ/ لوولوو ددانێ، لەب لەعل کانێ «مەولەوی»› ٢. گوڵێکە ٣. لۆلکەی جۆلا ☰ ١. مروارید ٢. گُلی است ٣. ابزاری در بافندگی

**لوله**[1] / lûle/: ناو. لوولا؛ لیله؛ لیلی؛ لوولێ؛ لولا؛ زڕندی؛ بۆری؛ بۆریە؛ بووری؛ لوولک؛ لەیلووک؛ لەلووک؛ کێسین: ١. کەرەستەیەکی خەڵەڵەی درێژ، بۆ گۆزاندنەوەی گاز و تراو ٢. بلوێر ٣. بێچووی ورچ و بەراز ٤. خشڵێکە بۆ دوعا تێخستن ٥. نەخۆشییەکی گوانی ئاژەڵ ☰ ١. لوله ٢. نی‌لبک ٣. بچەی خرس و خوک ۴. زیوری است ۵. نوعی بیماری پستان دام

◘ **لوله کردن**: ١. دروست کردنی لووله ٢. نواڵە کردن ☰ ١. ساختن لوله ٢. لوله کردن

**لوله**[2]: ئاوەڵناو. پێچراو؛ بادراو ☰ نوردیده

**لوله‌بەند** / lûlebend/: ناو. خشڵی لوولە کە دوعای تێ دەخەن ☰ زیوری است

**لوله پەڕ** / lûlepeř/: ☜ **لیلوپەڕ**

**لولەدار** / lûledar/: ئاوەڵناو. ١. تایبەتمەندی دەفرێ لوولەی هەیە ٢. تایبەتمەندی حەیوانێ کە نەخۆشی لوولەی گرتووە ☰ ١. لولەدار ٢. ویژگی دامی کە بیماری پستان دارد

**لوله‌ژەن** / lûlejen/: ناو. لوولکژەن؛ بلوێرژەن ☰ نوازندەی نی

**لولەسۆبە** / lûlesobe/: ناو. باکەش؛ بۆریەی کوورە ☰ لولەی بخاری

**لولەکی** / lûlekî/: ئاوەڵناو. وەکوو لوولە ☰ لولەمانند

**لولەکێش** / lûlekêş/: ناو. کەسێ کە کاری دانان و دامەزراندن و بەڕێخستنی لوولە، شێر، شێرفەلەکە، هەماراو و شتی وایە ☰ لولەکش

**لولەکێشی** / lûlekêşî/: ناو. ١. کاری دانان و دامەزراندنی لوولە ٢. کارگەی لوولەکێشی ٣. پیشەی لوولەکێش ☰ ١تا٣. لولەکشی

**لولەوزنجیر** / lûle w zincîr/: ناو. خشڵێکی سینەیە ☰ زیوری است

**لولەینە** / lûleyne/: ☜ **لولێنە**

**لولی** / lûlî/: ناو. پێچ و لوولی مووی سەر ☰ پیچ و تاب مو

**لولیان** / lûlyan/: چاوگ. لوول بوون؛ پێچ دران ☰ پیچ خوردن

**لولیک** / lûlîk/: ☜ **لاله**

**لولێ** / lûlê/: ☜ **لولێنە**

**لولێنە** / lûlêne/: ناو. لوولەینە؛ لوولێ؛ ئافتاوەی سواڵەت ☰ لولەهنگ؛ آفتابەی سُفالی

**لومە** / lûme/: ئاوەڵناو. لومە؛ ڕسوا؛ ناوزڕاو؛ ئابڕووتکاو ☰ رسوا

**لومەی** / lûmey/: ☜ **لۆمە**

**لومی** / lûmî/: ☜ **لیمۆ**

**لونایش** / lûnayîş/: چاوگ. لونایش؛ هەڵبەزین لە شوێنی خۆ ☰ ورجهیدن

**لونە** / lûne/: ناو. لیانی؛ لانەی باڵدار ☰ لانه

**لونەواز** / lûnewaz/: ☜ **لانەواز**

**لووەجن** / lûwecin/: ناو. ١. لووجن؛ دووکەڵ‌کێش ٢. کوورە؛ سۆبە ☰ ١. دودکش ٢. بُخاری

**لووەل** / lûwel/: ناو. ١. هەویری لە بن ژیلەمۆ برژاو ٢. کەلانە؛ جۆرێ خۆراکە ☰ ١. خمیر در خاکستر پخته ٢. نوعی غذا

**لووی** / lûwî/: ☜ **لویە**

**لوی** / lûy/: ☜ **لویە**

**لویشک** / lûyşik/: ☜ **لوشە ـ٢**

**لوینە** / lûyne/: ☜ **لوینە**

**لویە** / lûye/: ناو. لوی؛ لوو؛ لووی؛ لووی؛ ڕێوی؛ ڕواس؛ چتیر ☰ روباه

**لە**[1] / le/: ناو. لەز؛ پەلە ☰ عجله

**لە**[2]: ئامراز. ١. نە؛ جە؛ ژ؛ نیشانەی سەرەتایی ‹لە

دوێکەوە؛ لە پێش مادەکانەوە› ۲. هـۆ؛ سـۆنگە ‹لـە ترسا نەمزانی چی بێژم؛ لە ماندوویی و لە برسان لاقم دەلەرزی› ۳. بە هۆی؛ بە بۆنەی ‹لە تـۆی دەزانم› ٤. بەرامبـەری ‹لـە کـەس ناترسـم› ٥. نیشـانەی جووڵە؛ بزووتن: *ئا)* ڕاسـتای ‹لـە پـاڵ دەسـتمەوە فرتەی کرد› *ب)* بە درێژاییدا؛ لە تووڵ ‹لە پردەکـە پەڕینەوە› ٦. عۆدە؛ ئەستۆ ‹کاری وا لە من نایە› ۷. نیشانەی بەشێ یان هەمووی شتێ ‹پڕ لە شانازی؛ ئەوەش لە خۆمانە› ۸. سەبارەت بـە ‹لـە کاروبـاری خۆت بێژە› ۹. نیشـانەی بەرامبـەر کردنـەوە یـان جیـاوازی ‹ئـەم لـە ئـەو باشـترە؛ دەسـتی لـە پـای درێژترە› ۱۰. نیشانەی جنس ‹ماڵـەکانیان هـەموو لە قـوڕە› ۱۱. نیشانەی سەرچاوە یـان بنـەما ‹لـە هۆزی جافە› ۱۲. ئی؛ هین ‹ئەمە لە منە؛ لە کـەس نییە› ۱۳. بۆ؛ بە؛ وە؛ بۆ خاتری ‹لە چاوی تـۆ، ئـەو پێکـە دەخۆمـەوە› ١٤. بـۆ؛ بـەرەو؛ بـۆ لای ‹لـە ئاسمانی شینی ڕوانی› ۱٥. بە؛ نیشانەی بەرکاریی (مفعولی) ‹دەستم لە دەستی نەکەوتووە› ۱٦. وێنە؛ ڕەنگ؛ جۆر ‹کوڕەکەت لە خـۆت ئـەچێ› ۱۷. نـە؛ جە؛ دەناو ‹لە مـاڵ؛ لـە کێـو؛ لـە گیرفانمـدا› ۱۸. سەبارەت بە؛ لەمەڕ ‹لە شتی واوە قسەم نـەکردوە› ۱۹. کـات؛ دەم؛ گـاڤ ‹لـە ڕۆژ و لـە شـەو؛ لـە زستاناندا› ۲۰. لایەنی؛ لـە ڕوانگـەی ‹سـووت لـە ئیسلامدا حەرامە؛ لـە بـاوەڕی ئێـوەدا› ۲۱. بـەرەو؛ بەرەولای ‹ڕوو لە کوێ بکەم؟› ۲۲. بـۆ دەربـڕینی هەندی یان پاژێکی شتێک لـە ئاسـت هەموویـدا ‹یەک لە هەزاریمان نـەزانیوە› ⇆ ١تـا١٢. از ١٣. بـه خاطرِ ١٤تا١٦. به ١٧تا٢٢. در

• **له**[۲]: پاشگر. ۱. بۆ چووک نیشـان دان ‹براڵـە› ۲. بۆ خۆشەویستی ‹کاکەڵە› ⇆ ١. پسـوند تصـغير ٢. پسوند تحبيب

**لەب** / leb/: ناو. ۱. ☜ **لێو** ۲. لێـوارە؛ کـەنارەی هەر شتێ ۳. لەپ؛ بەری دەست ⇆ ١. ☜ **لێو** ٢. کناره ٣. كف دست

**لەبا**[۱] / leba/: ناوەڵـناو. */شـوورەیی/* بـەبا؛ نێرخـواز (دێڵ) ⇆ جفت‌خواه (ماده سگ)

**لەبا**[۲]: ئامراز. جەم؛ لنک ⇆ نزدِ

**لەبابەت** / lebabet/: ئـامراز. لـەباوەت؛ دەربـارەی ‹لەبابەت بێکاری و گرانییەوە قسە دەکا› ⇆ دربارەی

**لەبات**[۱] / lebat/: ناو. جووڵە؛ بزاو ⇆ جنبش؛ تکان

**لەبات**[۲]: ☜ **لەباتی**

**لەباتی** / lebatî/: ئـامراز. لەبات؛ لەباتیان؛ لەجیات؛ لەجیاتی؛ لەبری ‹ئەزانی من شەهیدی غەمزەم ئەی قەبرەڵکەنی دڵسۆز!/ لەباتی گـوڵ لـە قـەبرا تـۆ خـوا خارم لەبۆ ڕاخە! «بێخود»› ⇆ به عوض؛ به جای

**لەباتیان** / lebatîyan/: ☜ **لە باتی**

**لەبادە** / lebade/: ناو. کوڵەباڵ ⇆ نیمتنەی نمدی

**لەبار** / lebar/: ناوەڵـناو. ۱. بەکەڵـک؛ بـە دەرد خواردوو ‹... ئەو دارگوێزە چەند ڕەختە و لـەبارە بـۆ دەرگا و پەنجەرە لێ دروستکردن ... «سـوارە»› ۲. سازگار ‹ئەگەر حەوت و شەش لەگەڵ سـێ و چـوار بێ/ ڕەنگە بۆ ناوی مەتـەڵ لـەبار بـێ «گـۆران»› ۳. جوان و تەکووز ‹لـەباری، نـازەنینی، نـەرم و نۆڵـی، دڵتەڕی، شادی/ لە چاوی بەد بە دوور بی ئەی کچی جوانی مەهابادی! «هێمن»› ٤. شـیاو ‹ئـەم کـوردە گوردە ئێستا، کە بێ کەس و هەژارە/ ملی بـۆ شـیری دوژمن خوار و کەچە و لەبارە! «بێکـەس»› ٥. توانـا؛ لێهاتوو ‹گۆرانیبێژی خۆوێژی نەخوێندەوار هۆنەرن، کە لە هۆنینەوەدا لەبارن «هەژار، چێشـتی مجێـور»› ⇆ ١. مناسب؛ درخور ٢. سازگار ٣. زیبا؛ دارای تناسـب ۴. شایان ۵. توانا

**لەبارچووک** / lebarçûg/: ☜ **لەبەرچوو**

**لەبارەی** / lebarey/: ئـامراز. لەمـەڕ؛ دەربـارەی ⇆ دربارەی

**لەباری** / lebarî/: ئـامراز. باب؛ شەنگی؛ شـیاوی ⇆ شایستەی

**لەباڵەب** / lebaleb/: ☜ **لێوانلێو**

**لەبان** / leban/: ناو. ١. گیای حەسیر لێ چنین ٢. گزی؛ فێڵ؛ حیلە ⚏ ١. گیاه حصیربافی ٢. نیرنگ

**لەباو** / lebaw/: ئاوەڵناو. ١. بەڕەواج؛ بڕەودار ٢. ئامادە و گورجوگۆڵ ⚏ ١. رایج ٢. آمادە و چالاک

**لەباوەت** / lebawet/: ☜ **لەبابەت**

**لەبت** / lebt/: ناو. جووڵە؛ بزاو ⚏ جنبش؛ تکان

**لەبتاندن** / lebtandin/: چاوگ. جووڵاندن؛ تەکان پێ دان ⚏ تکان دادن

**لەبری** / leb(i)rî/: ئامراز. لەبرێتی؛ لەباتی؛ لەجیاتی ‹گەرەکتانە لەبری خوداپەرستنێ، ئەو شتانە بپەرستن؟! «هەژار، *قورئان*»› ⚏ بە جایِ

**لەبرێتی** / leb(i)rêtî/: ☜ **لەبری**

**لەبڕ** / lebiř/: ئاوەڵکار. ١. گۆترە؛ هەیکۆ ٢. بە قەبەڵ؛ کونتەراتی ⚏ ١. فلّەای ٢. کُنتراتی

**لەبڕی** / leb(i)řî/: ئاوەڵکار. کاری بە قەبەڵ ⚏ کار کُنتراتی

**لەبز** / lebz/: ناو. ١. فەرمایش؛ قسەی مرۆی ماقووڵ ٢. لێو؛ لەب ‹بزە و لەبزی شیرین، نیگای گەرموگوڕ «گۆران»› ⚏ ١. فرمایش ٢. لب

◻ **لەبز گەڕان:** دەم کردنەوە؛ هاتنە قسە ‹دەترسام هەر لەبزم بگەڕێ لە خوارەوە هەڵڕژێ! «هەژار، *چێشتی مجێور*»› ⚏ لب بە سخن گشودن

**لەبزەڕینە** / lebzeřîne/: ناو. لەمەزەڕینە؛ لەبزێڕینە؛ سەربەزێڕە؛ نیسکێنەی توند کە ڕۆنی قالکراوی بە سەردا دەکەن ⚏ آش عدس غلیظ کە روغن بر آن ریزند

**لەبزی** / lebzî/: ئاوەڵناو. بە قسەی ڕووبەڕوو ⚏ شفاهی

**لەبزینە** / lebzîne/: ناو. لەوزینە؛ جۆرێ شیرینی ⚏ لوزینە؛ نوعی شیرینی

**لەبزێڕینە** / lebzêřîne/: ☜ **لەبزەڕینە**

**لەبک** / lebk/: ناو. ١. چۆنیەتی سەرلێشێوان ٢. چۆنیەتی هۆشبڵاوبوون ⚏ ١. سردرگمی ٢. فراموشی

**لەبکاندن** / lebkandin/: چاوگ. ١. سەر لێ شێواندن ٢. ماندوو کردن ⚏ ١. کسی را هول کردن ٢. خستە کردن

**لەبککۆک** / lebikkok/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* کەمهۆش؛ بیربڵاو ⚏ حواس‌پرت

**لەبلمان** / lebilman/: ناو. جۆرێ قام و هەڵپەڕکێ کوردی ⚏ نوعی آواز و رقص کُردی

**لەبلەب** / lebleb/: ناو. جۆرێ کۆتر ⚏ نوعی کبوتر

**لەبلەبان** / lebleban/: ئاوەڵناو. قسەزان و دەمپاراو ‹پیاوێکی زۆر زیرەک و قسەزان و لەبلەبان و زمانلووس بوو. بە داخەوە هەرچەندی کردم نەمتوانی بە دڵ خۆشم بوێت، نازانم بۆچی! «هەژار، *چێشتی مجێور*»› ⚏ فصیح و سخنور

**لەبلەبی** / leblebî/: ناو. لوبلوبە؛ نۆکەسپیلکەی لە شیردا کوڵاوی وشکەوەکراو ⚏ لبلبی؛ نخودچی

**لەبن** / lebin/: ئاوەڵکار. ١. گش؛ گشت؛ تێکڕا ‹داری ئەم ناوچە، لەبن سووتا!› ٢. قەت؛ هەرگیز ‹من لەبن شتی وام نەدیوە› ٣. لە ڕەگەوە؛ لە ڕیشەوە ‹گوڵە کێوییەکان لەبن هەڵمەکێشن› ٤. بەگشتی ‹سنەیی لەبن کوردن› ⚏ ١. همە ٢. هرگز ٣. از ریشە ۴. کُلاً

**لەبنەوە** / leb(i)newe/: ئاوەڵکار. بە نهێنی؛ بە دزییەوە ‹دەیانبینی زۆر بە سەرکزی داماون و لەبنەوە چاوەچاویانە «هەژار، *قورئان*»› ⚏ پنهانی؛ دُزدکی

**لەبنەوەبڕ** / leb(i)newebiř/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* لە بەرەو باجی و لە بنەو قەیچی؛ تایبەتمەندی کەسێک کە خۆی وەک دۆست نیشان دەدا و بە نهێنی زەبر دەوەشێنێ ⚏ دوست ظاهری و دشمن باطنی

**لەبنەهاتوو / leb(i)nehatû/**: ئاوەڵناو. ١. ☜ لەبنهاتوو ٢. تەواوبوو ☰ ١. ☜ لەبنهاتوو ٢. تمام‌شده

**لەبنهاتوو / lebinhatû/**: ئاوەڵناو. لەبنەهاتوو: ١. قڕان تێکەوتوو ٢. بە ڕیشەوە دەرهاتوو ☰ ١. دودمان برباد رفته ٢. ریشه‌کن شده

**لەبۆچی / lebuçî/**: ناو. نەوگ‌ماڵ؛ کولاڤکەر ☰ نمدمال

**لەبۆ[1] / lebo/**: ☜ لباد

**لەبۆ[2] / lebo/**: ئامراز. ل‌بۆ: ١. بۆ؛ لۆ؛ ژبۆ؛ ئەڕای ‹سەبا بێنیٚ ئەگەر بێنیٚ لە زوڵفت دین و دڵ دینیٚ/ وەلیکن کەی دڵ و دینیٚ لەبۆ عوششاقی تۆ ماوە؟ «مەجدی»› ٢. بۆ؛ لۆ؛ ژبۆ؛ ئەڕای؛ بۆ خاتری ‹دزی خانەگی! واجبە کوشتنت/ لەبۆ عیبرەتی غەیرە، خوێن ڕشتنت «سافی»› ٢. بۆچی؛ چما ☰ ١. برای ٢. چرا

**لەبۆچی[1] / leboçî/**: ناو. کولاڤکەر؛ نمەدماڵ ☰ نمدمال

**لەبۆچی[2]**: ئاوەڵکار. بۆ؛ بۆچی ☰ چرا

**لەبو / lebû/**: ناو. بریانی؛ لباد؛ چۆنەر ☰ لبو

**لەبە / lebe/**: ناو. گۆشتی زۆر چەور ☰ گوشت بسیار چرب

**لەبەر[1] / leber/**: ئاوەڵناو. بەردار؛ بە میوە ☰ ثمردار

⊡ **لەبەر بون**: ١. لەبەردا بوون ‹کراسێکی جوانی لەبەر بوو› ٢. لە حیفز بوون ‹هەموو شیعرەکەم لەبەرە› ٣. لە پێش بوون ‹ڕێگایەکی دوورم لەبەرە› ☰ ١. به تن داشتن ٢. از حفظ بودن ٣. پیش رو داشتن

**لەبەر[2]**: ئاوەڵکار. بە حیفزی ‹لە مابەینی هەر جارێک خوێندنی سوورەتدا، ئەم دوعایە لەبەر بخوێنە! «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ حفظی؛ ازبر

**لەبەر[3]**: ئامراز. ١. بۆ خاتری؛ بە سەبەبی ‹خۆفم لە خودا چونکە لەبەر غەیری خودایە/ ئەمنم بە درۆ، سوورەتی وەک خەوف و ڕەجایە «حەریق»› ٢. لە لای؛ لە کنی ‹هەر لەبەر خۆمەوە لە خوا دەپاڕامەوە ئەو بەدفەڕە بمریٚ و لە کۆڵ دنیا بێتەوە! «هەژار، چێشتی مجێور»› ٣. لە ئاست؛ لە حاند ‹سەری کوڵمت گەشە، هەر وەک گوڵی کوێستانی کوردستان/ لەبەر بەژنت دەبیٚ سەر دانەوێنیٚ خەڵفی شمشادی «هێمن»› ٤. پێش؛ لە بەر دەم ‹لەم حوجرە لەبەر پەنجەرە کەوتووم و دەخوێنم/ بێعەینی دەڵەی بولبولی گۆشەی قەفەسێکم «نالی»› ٥. لە ژێر کاریگەری ‹لەبەر تۆزی سواران، ڕۆژی ڕووناک و تاووساو، ببووە شەوەزنگێکی ئەنگوست‌لەچاو «هەژار، *شەرەفنامە*»› ٦. لە ژێر ‹نە نووسەکەی پێوە نووسا/ نە لەبەر بارانیٚ خووسا «هێمن»› ☰ ١. به خاطرِ ٢. پیشِ ٣. در برابرِ ۴. در مقابلِ ۵. بر اثرِ ۶. زیرِ

⊡ **لەبەر گران بون**: پیٚ تاڵ/ ناخۆش/ سەخت بوون؛ لە سەر گران بوون ‹ئەو زستانە ـ هەر چەندە زۆرم لەبەر گران بوو ـ دەگەڵ کوڕانی ماڵی ئاغای ژیام و دەبوو بە پێی ڕیٚ و شوێنی ماڵی ئاغا بزوومەوە «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ گران آمدن

**لەبەر حوکمی کەسیٚ خەلاس بون**: لە ژێر دەسەڵاتی کەسێکدا نەمان ‹بەیانی ئاوا بووینە دیوی عێراق، نەفەسێکی ئاسوودەم هەڵکێشا: ئۆخەی لەبەر حوکمی عەجەم خەلاس بووم... «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ از زیر سلطه‌ی کسی خارج شدن

**لەبەر یەک چون**: لێک بڵاو بون؛ تێکچوون ‹سەرباز تفەنگیان داوە بە نانێک و لە کۆڵ خۆیان کردۆتەوە و بەوپەڕی ڕەزیلی، دەوڵەت لەبەر یەک چووە «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ از هم پاشیدن

**لەبەرا / lebera/**: ئاوەڵکار. وەڵێنە؛ سەرەتا؛ لە هەوەڵا ☰ ابتدا

**لەبەرچاو / leberçaw/**: ئاوەڵناو. ١. دیار؛ خویا؛ ئاشکرا ٢. لە بیر نەکراو ‹چاکەی تۆم لەبەرچاو بوو›

ﺍ ١. آشکار ٢. فراموش‌نشده

**لەبەرچو** / leberçû/: ئاوەڵناو. لەبەرچووگ؛ لەبارچووگ؛ بە مردوویی زاو ﺍ مُرده به دنیا آمده

**لەبەرچووگ** / leberçûg/: ☜ **لەبەرچو**

**لەبەرچی** / leberçî/: ئاوەڵکار. چما؛ ئەڕا ﺍ چرا

**لەبەردڵ** / leberdił/: ئاوەڵناو. پەسن؛ بەدڵ؛ بەردڵ ﺍ پسندیده؛ مورد پسند

**لەبەردڵان** / leberd(i)łan/: ئاوەڵناو. خۆشەویست؛ خاڵخاس؛ فرۆک ﺍ پسندیده

**لەبەرکەوتو** / leberkewtû/: ئاوەڵناو. قسر؛ قرد ﺍ از ثمر افتاده (زادوولد)

**لەبەرەوە** / leberewe/: ئاوەڵکار. ١. لەپێشتر؛ لەپێشووتر ‹لەبەرەوە خۆی هات، دوایی کاکی› ٢. لە پێشەوە؛ دژی لە دواوە ‹لەبەرەوە دانیشە› ﺍ ١. از پیش؛ از قبل ٢. از جلو

**لەبەن** / leben/: ناو. قامیش؛ چیت؛ زەڵ ﺍ نی

**لەبەهانە** / lebehane/: ئاوەڵناو. بیانووگر؛ بەهانەگیر؛ بیانک‌گیر ﺍ بهانەجو؛ بهانەگیر

**لەبەیش** / lebeyş/: ☜ **لەبیایش**

**لەبیایش** / leb(i)yayîş/: چاوگ. لەبەیش؛ پاڕانەوە؛ لالانەوە ﺍ لابە کردن

**لەبیخە** / lebîxe/: ناو. لەپێخە؛ شەڵتەی سەر برین ﺍ ضماد

**لەبیرچو** / lebîrçû/: ☜ **لەبیرکراو**

**لەبیرکراو** / lebîrk(i)raw/: ئاوەڵناو. لەبیرچوو؛ فەرامۆش‌کراو ‹هۆزی لەبیرکراوی گاوان› ﺍ فراموش‌شده

**لەبێ** / lebê/: ئاوەڵکار. بەڵێ؛ ئا ﺍ بلی

**لەپ** / lep/: ناو. ١. بەری دەست ‹گشتی لەپ و پەنجە سوور و ئاڵ بوون/ بێ‌ڕەنگ و خەنە، لە خوێن شەلال بوون «هەژار، *مەم و زین*»› ٢. لچی ئەستوور ٣. پەلە؛ لەز ﺍ ١. کف دست ٢. لب کلفت ٣. عجله

**لەپارە** / lepare/: ناو. ١. پارچە و لەتی بە قەد لەپی دەست ٢. گوشمەی گوێز و توو ﺍ ١. قطعەی به اندازەی کف دست ٢. توت و گردوی باهم کوبیده

**لەپاش** / lepaş/: ئاوەڵکار. دوای ‹لەپاش تەنگانە فەرحانین، ئارێ، لە پاش تەنگانە فەرحانی هەیە «هەژار، قورئان»› ﺍ پس از

**لەپاشا** / le paşa/: ☜ **لەپاشان**

**لەپاشان** / le paşan/: ئاوەڵکار. لەپاشا؛ لەپاشانا؛ بە دوای ﺍ سپس

**لەپاشانا** / le paşana/: ☜ **لەپاشان**

**لەپان** / lepan/: ناو. پانیەی پێ ﺍ پاشنەی پا

**لەپاندن** / lepandin/: چاوگ. زەباندن؛ هەڵفریواندن ﺍ فریفتن

**لەپای** / lepay/: ئامراز. بە عۆدە؛ لەسەر ‹ئەو کارە لەپای من› ﺍ بر عُهدەی

**لەپتر** / leptir/: ناو. شێوێکە لە وردە ساوار و گۆشت ﺍ آشی است

**لەپڕ** / lepiř/: ئاوەڵکار. لەپڕ؛ لەپڕایەکی؛ لەپڕڕا؛ لەپڕێ؛ کتوپڕ؛ ناکاو ‹... بە ئارەزوون ئێوە ئاگاو لە چەک و ئەسبابتان ببڕێ و لەپڕ پەلامارتان بدەن «هەژار، قورئان»› ﺍ ناگهان؛ یکهو

**لەپڕا** / lep(i)řa/: ☜ **لەپڕ**

**لەپڕایەکی** / lep(i)řayekî/: ☜ **لەپڕ**

**لەپڕڕا** / lepiřřa/: ☜ **لەپڕ**

**لەپڕی** / lep(i)řî/: ئاوەڵناو. کوتوپڕی؛ ناکاو؛ یەکهۆ؛ بێ‌خەبەر ‹ئازاری لەپڕی چاو بە هۆی ڕوودانی کێشەیەکی دەمارییە› ﺍ ناگهانی

**لەپڕێ** / lep(i)řê/: ☜ **لەپڕ**

**لەپک** / lepk/: ناو. ١. ☜ **لاپك** ٢. وێنەی پەنجە لە بەڕەدا ﺍ ١. ☜ **لاپك** ٢. نقش پنجه در گلیم

**لەپکە** / lepke/: ناو. ١. زاخی شین؛ مووررووی شین کە دەرمانی برینانە ٢. گوێ‌ماسیلە ﺍ ١. زاج کبود؛ کات کبود ٢. گوش ماهی

**لەپگ / lepig/**: ناو. دوگمە؛ دگمە؛ لیگ ≡ دُکمـه؛ تُکمه

**لەپ،لەپ / lep lep/**: دەنگەناو. دەنگی ویک‌کەوتنی تیخ ≡ چکاچک

**لەپماڵ / lepmał/**: نـاو. ١. کـاری دەسـت پێـدا هێنان و شێلان ٢. کاری بە دەست کۆ کردنـەوە ≡ ١. ماساژ ٢. گردآوری با کف دست

**لەپولەوس / lep û lews/**: ناو/ *[پلار]* دەموفلـچ؛ دەمولەوس ≡ لبولوچه

**لەپۆ / lepo/**: نـاو. هـەویرترش؛ ئامیـانی هـەویر گەیاندن ≡ خمیرمایه

**لەپۆرت / leport/**: نـاو. نـانی هـەنجیر ≡ لواشـک انجیر

**لەپۆل / lepol/**: ئاوەڵناو. شەپلەلێداو ≡ فلج

**لەپە[1] / lepe/**: نـاو. ١. لاپە؛ نخۆشـەر؛ لەتکـەنۆک ٢. ☜ **لەپەتیر** ٣. سواغ بە دەست ٤. لەپ؛ پەلە؛ لەز ٥. *[کینایە]* دووپشـکی زەلام ≡ ١. لپّـه ٢. ☜ **لەپەتیر** ٣. عمل اندودن با دسـت ٤. عجلـه ٥. کـژدُم بزرگ

**لەپە[2]**: ئاوەڵناو. پڕاوپڕ؛ تەژە ≡ پُر

**لەپـەتیر / lepetîr/**: نـاو. لەپـە؛ دەسـخۆر ≡ آش غلیظ حبوبات

**لەپەر / leper/**: ناو. زیپکەی زۆر بـەژان ≡ جـوش سوزناک

**لەپەسا / lepesa/**: ☜ **لەپەستا**

**لەپەستا / lepesta/**: ئاوەڵـکار. لەپەسـا؛ بـەردەوام ‹مەپسێنەوە بیاندەرێ لەپەستا/ تا بێبـەش ئـەبن لـە هۆش و هەستا «هەژار، *مەم و زین*»› ≡ مُدام

**لەپەکوتێ / lepckutê/**: نـاو. دەسـتەکوتێ؛ کـاری دەسکوتانی کوێرانە ≡ عمل دست گرداندن کورانه

**لەپەلەپ / lepelep/**: ئاوەڵکار. پەلەپەل؛ بەلـەز ≡ شتابان

**لەپـەوڕو / lepewřû/**: ئاوەڵـکار. دەمـەوڕوو ≡ در حالت دمر

**لەپیک / lepîk/**: ☜ **لاپك**

**لەپین / lepîn/**: چاوگ. ١. بە لادا هـاتن ٢. پەلـە کردن ٣. گورگەلۆقـە کـردن ≡ ١. کـج شـدن ٢. عجله کردن ٣. هَروله کردن

**لەپێخە / lepêxe/**: ☜ **لەبیخە**

**لـەپێش[1] / lepêş/**: ئاوەڵـناو. ١. بـەڕێز و قـەدر ٢. پێشڕەو؛ پێشەنگ ≡ ١. مُحترم ٢. پیشتاز

**لەپێش[2]**: ئاوەڵـکار. ١. بـەر لـە ‹لـەپێش تۆشـا زۆر هیوای گەش بێ سەروشوێن بـوو/ گـەڵێ خونچـەی نەپشکووتوو خلتانی خوێن بوو «گـۆران»› ٢. لەبـەر ‹گەڕی شاییم لەپێش چاوی گـەڕاوە/ لـەرەی مـەم، سووکەڕەوتی گوێبەگواران «هێمن»› ≡ ١. پیش از ٢. جلو

**لەپێشتر / lepêştir/**: ئاوەڵکار. لەبەروە؛ لەپێشـووتر ≡ از پیش؛ از قبل

**لەپێک / lepêk/**: ☜ **لاپك**

**لەپێکەوتـو / lepêkewtû/**: ئاوەڵـناو. بـێ‌هێـز؛ بێ‌توان ‹تۆ دەشـتی ئەوپـەڕ نادیـاری/ بـۆ چۆڵـبڕی لەپێ‌کەوتوو/ تاپۆی شاری «سوارە»› ≡ ازپاافتاده

**لەت[1] / let/**: ناو. ١. پارچە؛ پـاژ؛ لـەتک ‹شیشـەکە شـکا و هـەر لـەتێکی کەوتـە شـوێنێ› ٢. کەڵـەکە بەردی ناو زەوی ٣. گوێچی داکراو لە گەمـەدا ٤. جمک؛ ئاواڵدوانە ≡ ١. تکه؛ قطعه ٢. تودەی سنگ در زمین ٣. شتالنگ ریخته در زمین ٤. دوقلو

**لەت[2]**: ئاوەڵـناو. شکاو؛ خاوەن شـکاوی ≡ شکسـته؛ پاره

▣ **لەت بوون**: شکان؛ پارچە بوون ≡ شکستن؛ قطعه شدن

**لەت کردن**: ١. شکاندن؛ پاژ ـ پاژ کردن ٢. بڕین ‹تیغی بێ‌مەیلی و جەفای ئـەو نازەنینـە دڵـڕەقە/ جەرگی لەت کردم بە جارێ، ئەنجنیویە سینەشـم «هێمن»› ٣. کوت کردن؛ جیا کردنەوەی میوە

بۆ وشکەوە کردن ‹دوو بار قەیسیمان لەت کـرد›
🇮🇷 ١. شکستن ٢. بُریدن ٣. شکافتن

**لەتار** / letar/: ئاوەڵناو. شەقار ـ شەقار؛ لەت ـ لەت
🇮🇷 پارە ـ پارە

**لەتار ـ لەتار** / letar letar/: ئاوەڵناو. کوت ـ کوت؛ لەت ـ لەت ‹مەر بە باد بەد لەتار ـ لەتار بۆ/ نمـازۆ بالای قیبلەم دیار بۆ «بێسـارانی»› 🇮🇷 پـارە ـ پـارە؛ تکە ـ تکە

**لەتان** / letan/: چاوگ. ١. خوست لێ بران؛ تەواو بێدەنگ بوون ٢. داسـەکان؛ ئـۆقرە گـرتن 🇮🇷 ١. بی‌صدا شدن ٢. آرام گرفتن

**لەتاندن** / letandin/: چاوگ. ١. وست/ بێـدەنگ کردن ٢. داسەکاندن؛ ئـارام کـردن 🇮🇷 ١. سـاکت کردن ٢. آرام کردن

**لەتاو** / letaw/: ئـامراز. لەبـەر؛ بـە هـۆی زۆری و تەوژمەوە ‹دەسم برد بۆ چڵی داری/ لەتاو ئـازار لـق داچڵەکی ... «شێرکۆ»› 🇮🇷 از شدتِ

**لەتاوا** / letawa/: ☜ لە تاوان

**لەتاوان** / letawan/: ئـامراز. لەتاوا؛ لـەتاوانا: ١. لـە تاسە و ئارەزوودا ‹وەختە لەتاوان بچم بـە کێـوا/ بـۆ ماچی خوشکە گوڵ‌ئەندامەکەت «ویسالـی»› ٢. لـە بەر ئێش و ژان ‹ئەم ئاگرە تەنییەوە لە لاوان/ سووتا دڵی دڵتەڕان لەتاوان «هەژار، مـەم و زیـن»› ٣. لـە ناچاری و زۆر بۆ هـاتن ‹توانـای نـەبوو کـل بگاتـە چاوان/ هەر بوو بە خەڵووزی ڕەش لـەتاوان «هـەژار، *مەم و زین*»› 🇮🇷 ١. از شوق ٢. از درد ٣. از ناچاری

**لەتاوانا** / letawana/: ☜ لەتاوان

**لەتبو** / letbû/: ئاوەڵناو. شکاو؛ شکیاو 🇮🇷 شکستە

**لەتر** / letr/: ناو. ڕەت؛ تبووق؛ تلوو؛ تمـق؛ کـاری تل دانی بە پێوە 🇮🇷 عمل تلو خوردن

⊡ **لەتر بردن**: لەتر دان: ١. ڕەت بردن ٢. *[کینایە]* بێهێز و هاز بوون 🇮🇷 ١. تلو خوردن ٢. بـی‌حـال بودن

**لەتر دان**: ☜ **لەتر بردن**

**لەتراولەتر** / letrawletir/: ئاوەڵکار. بە لـەتر دانی لە پەستا ‹لەتراولەتر گەیشتەوە ماڵێ› 🇮🇷 تلوخوران

**لەترمە** / letirme/: ناو. بەڵا؛ بەلا؛ چۆرتم 🇮🇷 بلا

**لەتک** / letik/: ناو. لەت؛ پاژ 🇮🇷 نیمە؛ قطعە

**لەتکە** / letke/: ناو. میوەی قاشـکراو لـە بـەر تـاو ئیشکەوەکراو بۆ زستان ‹لەتکە قەیسی› 🇮🇷 برگەی میوە

**لەتکەنۆک** / letkenok/: ☜ **لەپە**[1]**ـ١**

**لەت.لەت** / let let/: ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. پارچە ـ پارچـە؛ پاژ ـ پاژ 🇮🇷 قطعە ـ قطعە

**لەتم** / letm/: ناو. زۆرکاری؛ ستەم؛ زوڵم؛ ناهـەقی 🇮🇷 ظلم؛ جور

**لەتمە** / letme/: نـاو. زەربە؛ زیـان ‹لۆمـەیی نـالیی دێوانە مەکەن ئەی عوقـەلا!/ ئەمـە مووددێکـە زەدەی لەتمەیی دەستی پەرییە «نالی»› 🇮🇷 لطمە؛ ضربە

**لەتوپەت** / let û pet/: ئاوەڵناو. وردوخان؛ شـکاوی زۆر پارچە پارچە 🇮🇷 خردوخاک‌شیر

**لـەتوپـەتکـراو** / let û petk(i)raw/: ئاوەڵـناو. هنجراندی؛ هنجری 🇮🇷 لت‌وپار شدە

**لـەتوکوت** / let û kut/: ئاوەڵناو. پارچە ـ پارچە ‹یـا ڕەب لەت‌وکوت و شەق و پەق بـێ دڵـم ئەگـەر/ بـێ یادی تۆ بێ، یەک دەم و یەک ئـان و یـەک سـەعات «ئەحمەد موختار جاف»› 🇮🇷 قطعە ـ قطعە

**لەتە**[1] / lete/: ناو. لەت؛ پارچە؛ پاژێ لـە شـتێ 🇮🇷 پارە؛ قطعە

**لەتە ـ**[2]: پێشوشـە. بەشێ لە شتێ؛ شکاوی لە شـتێ ‹لەتەئاجۆر؛ لەتەنان› 🇮🇷 پارە ـ

**ـ لەتـە**[3]: پاشەوشە. بەشە شکاوی شتێ ‹هەمرۆلەتـە؛ نانلەتە› 🇮🇷 ـ پارە

**لەتەجەرگ** / letecerg/: ناو. ١. کوتێ لە کەزب ٢. *[کینایە]* خوێنی مەییو ٣. *[کینایە]* فرزەنـد؛ ڕۆڵـە 🇮🇷 ١. بُرشی از جگر ٢. خون منعقد ٣. جگرگوشە؛ فرزند

**لەتەچن / leteçin/**: ناو. لەتەچین؛ پارسەکی نانچنینەوە لە مالان ‹خێڵ نەبەزی لەتەچن بەزی! «مەسەل»› ☰ گدای نان و خوراک

**لەتەچنی / leteç(i)nî/**: ناو. لەتەچینی؛ پارسەکی؛ گەدایی ☰ گدایی

**لەتەچین / leteçîn/**: ☜ لەتەچن

**لەتەچینی / leteçînî/**: ☜ لەتەچنی

**لەتەر / leter/**: ناو. لەتەرە: ١. پووز؛ بەلەک ‹لنگ و لەتەری بەرەلا کردووە!› ٢. تەشی؛ نەتەرە ☰ ١. ساق ٢. دوک

**لەتەرە / letere/**: ناو. ١. ☜ لەتەر ٢. لەقەرە؛ بەری بێستان ☰ ١. ☜ لەتەر ٢. محصول جالیزی

▣ **لەتەرە دان**: لەقەرە دان؛ داپۆشینی بەری بێستان بە برکەکەیەوە بۆ ئەوەی کەس لێی نەکاتەوە ☰ استتار کردن محصول جالیز

**لەتەرەبۆق / letereboq/**: ئاوەڵناو. [پـلار] زگزلی قاچ باریک ☰ شکم‌گندەی ساق باریک

**لەتەرەڕێسە / letereřêse/**: ناو. تەشیڕێس؛ کەسێ کە بە تەشی، خوری بادەدا ☰ دوک‌ریس

**لەتەری / leterî/**: ناو. کلافە؛ خەڕەک؛ لۆتەر ☰ دوک نخ ریسی

**لەتەسواڵەت / letes(i)wałet/**: ناو. تاسوولقە؛ شکەلک؛ ئەشکەولەت ☰ قطعەی سفالین

**لەتەک**[1] **/ letek/**: ئاوەڵکار. هەرکە؛ تا ‹لەتەک ئێمەی دی، دەرچوو!› ☰ همین کە

**لەتەک**[2]: ئامراز. دەگەڵ؛ تەک ‹لەتەک تۆمە!› ☰ با

**لەتە-لەتە**[1] **/ lete lete/**: ئاوەڵناو. کەت-کەت ‹سواڵەتی لەتە-لەتەی کۆ دەکردەوە› ☰ پارە-پارە

**لەتە-لەتە**[2]: ئاوەڵکار. پارچە-پارچە ‹لەتە-لەتە کۆیان دەکاتەوە› ☰ قطعە-قطعە

**لەتەوچێن / letewçên/**: ئاوەڵناو. لەتەچن؛ سواڵکەر ☰ گدا

**لەتەورگ / letewirg/**: ناو. پەلەورگ ☰ تکّە شکمبە

**لەتەولا / letewla/**: ☜ لاولاو

**لەتی / letî/**: ناو. جڕ؛ دڕاوی ☰ پارگی

**لەتێک / letêk/**: ئاوەڵکار. کەرتەک؛ کوتێک؛ پارچەیەک ‹بۆ لەتێک نان، سەتان ڕەت دان› ☰ یک قطعە؛ قطعەای

**لەج**[1] **/ lec/**: ☜ لەنج[1]

▣ **لەج کردن**: ☜ لەنج کردن

**لەج**[2]: ئاوەڵناو. لاسار ☰ خیرەسر

**لەجبازی / lecbazî/**: ناو. لاساری؛ سەرەخەری؛ ئاکاری دژ بە مەیل و داخوازی کەسێک بۆ بەرهەڵست بوونی. هەروها: **لەجباز** ☰ لجبازی

**لەجە / lece/**: ناو. ١. لاساری ٢. دەردیدڵ؛ گلەیی لە بەخت ☰ ١. خیرەسری ٢. درددِل

**لەجەر / lecer/**: ئاوەڵناو. لاواز؛ کز؛ داڵگۆشت ‹کوردستانی ڕەنگین و بژوێن، باوەشی دایکانەی بۆ ئەو برسی و ڕەش و رووتانە، بۆ ئەو لاواز و لەجەرانە، بۆ ئەو لێقەوماو و دەربەدەرانە کردەوە «هێمن»› ☰ لاغر

**لەجەری / lecerî/**: ناو. نەخۆشی بناوبوێری وردەماڵە کە گەرووی دەپەنمێ ☰ نوعی بیماری دام

**لەجیات / lec(i)yat/**: ☜ لەباتی

**لەجیاتی / lec(i)yatî/**: ☜ لەباتی

**لەجێ**[1] **/ lecê/**: ئاوەڵناو. بەجێ؛ ڕەوا ☰ بەجا؛ روا

**لەجێ**[2]: ئاوەڵکار. دەسبەجێ؛ دەمودەست ‹بمبەخشە گوتی، سەرم لە بەر پێت/ هەر دامەوە پێت، لەجێ دەبم شێت «هەژار، *مەم و زین*»› ☰ فوراً

**لەجێچوو / lecêçû/**: ئاوەڵناو. گەڕاو؛ لە بەند ترازاو ☰ از جا دررفتە

**لەچ / leç/**: ☜ لەچك

**لەچاو / leçaw/**: ئامراز. لە بەرانبەر ☰ در مقابل

**لەچک** / leç(i)k/: ناو. لاچک؛ لچک؛ لەچ؛ لەچەک؛ لەچکە؛ لەچیک: ١. سەرپۆشی ژنانە ٢. لک؛ گۆشەی دەسماڵ و بوخچە و... ☰ ١. لچک ٢. گوشەی دستمال و بقچە و ...

**لەچکبەسەر** / leç(i)kbeser/: ناو. *[کینایە]* لەچکبەسەرە؛ ژن ☰ زن

**لەچکبەسەرە** / leç(i)kbesere/: ☜ **لەچكبەسەر**

**لەچکدار** / leç(i)kdar/: ناو. *[کینایە]* پیاوی بەناموس و غیرەت ☰ مرد باغیرت

**لەچکە** / leçke/: ☜ **لەچك**

**لەچە** / leçe/: ئاوەڵکار. ١. بۆ؛ بۆچی ٢. دەربارەی چی ☰ ١. برای چە ٢. از چە

**لەچەر** / leçer/: ئاوەڵناو. ١. ڕژد؛ ڕەزیل؛ چکووس ‹زۆر ماڵی وا هەبوون ئەو ژەمە بۆ خۆیان هیچیان نەدەخوارد و دەیاندا بەو میوانە ڕەش و رووت و برسی و خورێنانە... ماڵی زۆر لەچەر و پیسکە نەبا ئەو ساڵی رزقی بۆ نەگیرا «هێمن»› ٢. پەڵپگر؛ بەبڕوبیانوو ☰ ١. خسیس ٢. بهانەگیر

**لەچەک** / leçek/: ☜ **لەچك**

◻ **لەچەک کردن**: دەم و لووت بە دەسماڵ بەستن ☰ نقاب بە چهرە زدن

**لەچەنە** / leçene/: ناو. ئەرزینگ؛ لێو؛ لەوس ☰ لب

**لەچیک** / leçîk/: ☜ **لەچك**

**لەحاست** / le ĥast/: ئامراز. لەحاند؛ لەعاست؛ لەعاستی؛ لەعان؛ لەعاند؛ لە بەرانبەر؛ لە ڕووی ‹سووتاوە، زوخاڵە جەرگ و ناوی/ خۆ ناگرێ لەحاستی مەستی چاوی «هەژار، *مەم و زین*»› ☰ در برابر؛ در مقابل

**لەحاند** / leĥand/: ☜ **لەحاست**

**لەحد** / leĥd/: ناو. یەکشەممە ☰ یکشنبە

**لەحزە** / leĥze/: ناو. تاوێکی کەم ☰ آن؛ لحظە

**لەحەیف**[1] / leĥeyf/: ☜ **لێفە**

**لەحەیف**[2]: ئاوەڵکار. لەداخ؛ لەداخان ‹تۆ ئەزانی شەوگار لەحەیفی خۆرەتاو، دڵی پڕە «ژیلا حسەینی»› ☰ از حسرت

**لەحەیفان** / leĥeyfan/: ئاوەڵکار. لەحەیف؛ لەداخان؛ بە هۆی تووڕەیی یان شەرمەزارییەوە ‹کە دەبیستێ ژنە جوولەکێکی هەژار زوڵم و ناهەقی لێ کراوە، هاوار دەکا ئای لەم شەرمە نارەوایە! پیاو ئەگەر لە حەیفان بمرێ، کەس نابێ سەرکۆنەی بکا «هەژار، *چوار نامیلکە*»› ☰ از عصبانیّت یا شرمساری

**لەحەیوەتا** / leĥeyweta/: ☜ **لەعەیبەتان**

**لەحیم** / leĥîm/: ناو. لحیم؛ لحێم؛ لهێم؛ کانزا یان ئالیاژێ کە تواوەکەی بۆ کون و کەلێن گرتن یان لکاندنی دوو کانزا پێکەوە بە کەڵک دێت ☰ لحیم

**لەحیمچی** / leĥîmçî/: ☜ **لەحیمکار**

**لەحیمکار** / leĥîmkar/: ناو. لەحیمچی؛ کەسێ کە کانزا جۆش دەکاتەوە ☰ لحیم‌کار

**لەحێوەت** / leĥêwet/: ☜ **لەعەیبەتان**

**لەحێوەتا** / leĥêweta/: ☜ **لەعەیبەتان**

**لەخاف** / lexaf/: ☜ **لەغاو**

**لەخاڤ** / lexav/: ☜ **لەغاو**

**لەخت** / lext/: ناو. ١. بەدەن؛ ئەندامانی لەش بە تێکڕایی ٢. دانی باڵدار ☰ ١. تَن؛ کالبد ٢. دانەی پرندە

**لەختولار** / lext û lar/: ئاوەڵناو. لەش‌ولار؛ شل‌ومل ☰ نرم‌اندام رعنا

**لەخرێن** / lexrên/: ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. لەخرێنی؛ لەخورێن؛ لەخورێنی؛ لەرخێنی؛ ناشت؛ هیچ‌نەخواردوو لە پاش لە خەو هەستان ☰ ناشتا؛ صبحانەنخوردە

**لەخرێنی** / lexrênî/: ☜ **لەخرێن**

**لەخش** / lexş/: ☜ **لەخشە**

**لەخشان** / lexşan/: ☜ **لەخشین**

**لەخشتەبراو** / lexişteb(i)raw/: ئاوەڵناو. فریودراو

**لەچك / leç(i)k/**: ناو. لاچک؛ لچک؛ لەچ؛ لەچەک؛ لەچکە؛ لەچیک: ١. سەرپۆشی ژنانە ٢. لک؛ گۆشەی دەسماڵ و بوخچە و... ☰ ١. لچک ٢. گوشەی دستمال و بقچە و ...

**لەچکبەسەر / leç(i)kbeser/**: ناو. [کنایە] لەچکبەسەرە؛ ژن ☰ زن

**لەچکبەسەرە / leç(i)kbesere/**: ☜ لەچكبەسەر

**لەچکدار / leç(i)kdar/**: ناو. [کنایە] پیاوی بەنامووس و غیرەت ☰ مرد باغیرت

**لەچکە / leçke/**: ☜ لەچك

**لەچە / leçe/**: ئاوەڵکار. ١. بۆ؛ بۆچی ٢. دەربارەی چی ☰ ١. برای چە ٢. از چە

**لەچەر / leçer/**: ئاوەڵناو. ١. ڕژد؛ ڕەزیل؛ چکووس ‹زۆر ماڵی وا هەبوون ئەو ژەمە بۆ خۆیان هیچیان نەدەخوارد و دەیاندا بەو میوانە ڕەش و ڕووت و برسی و خوڕێنانە... ماڵی زۆر لەچەر و پیسکە نەبا ئەو ساڵی رزقی بۆ نەگیرا «هێمن»› ٢. پەڵپ‌گر؛ بەبڕوبیانوو ☰ ١. خسیس ٢. بهانەگیر

**لەچەک / leçek/**: ☜ لەچك

⊡ **لەچەک کردن**: دەم و لووت بە دەسماڵ بەستن ☰ نقاب بە چهرە زدن

**لەچەنە / leçene/**: ناو. ئەرزینگ؛ لێو؛ لەوس ☰ لب

**لەچیک / leçîk/**: ☜ لەچك

**لەحاست / le ĥast/**: ئامراز. لەحاند؛ لەعاست؛ لەعاستی؛ لەعان؛ لەعاند؛ لە بەرانبەر؛ لە ڕووی ‹سووتاوە، زوخاڵە جەرگ و ناوی/ خۆ ناگرێ لەحاستی مەستی چاوی «هەژار، *مەم و زین*»› ☰ در برابر؛ در مقابل

**لەحاند / leĥand/**: ☜ لەحاست

**لەحد / leĥd/**: ناو. یەکشەممە ☰ یکشنبه

**لەحزە / leĥze/**: ناو. تاوێکی کەم ☰ آن؛ لحظه

**لەحەیف[1] / leĥeyf/**: ☜ لێفە

**لەحەیف[2]**: ئاوەڵکار. لەداخ؛ لەداخان ‹تۆ ئەزانی شەوگار لەحەیفی خۆرەتاو، دڵی پڕە «ژیلا حسەینی»› ☰ از حسرت

**لەحەیفان / leĥeyfan/**: ئاوەڵکار. لەحەیف؛ لەداخان؛ بە هۆی تووڕەیی یان شەرمەزارییەوە ‹کە دەبیستێ ژنە جوولەکێکی هەژار زوڵم و ناهەقی لێ کراوە، هاوار دەکا ئای لەم شەرمە نارەوایە! پیاو ئەگەر لە حەیفان بمرێ، کەس نابێ سەرکۆنەی بکا «هەژار، *چوار نامیلکە*»› ☰ از عصبانیّت یا شرمساری

**لەحەیوەتا / leĥeyweta/**: ☜ لەعەیبەتان

**لەحیم / leĥîm/**: ناو. لحیم؛ لحێم؛ لهێم؛ کانزا یان ئالیاژێ کە تواوەکەی بۆ کون و کەلێن گرتن یان لکاندنی دوو کانزا پێکەوە بە کەڵک دێت ☰ لحیم

**لەحیمچی / leĥîmçî/**: ☜ لەحیمکار

**لەحیمکار / leĥîmkar/**: ناو. لەحیمچی؛ کەسێ کە کانزا جۆش دەکاتەوە ☰ لحیم‌کار

**لەحێوەت / leĥêwet/**: ☜ لەعەیبەتان

**لەحێوەتا / leĥêweta/**: ☜ لەعەیبەتان

**لەخاف / lexaf/**: ☜ لەغاو

**لەخاڤ / lexav/**: ☜ لەغاو

**لەخت / lext/**: ناو. ١. بەدەن؛ ئەندامانی لەش بە تێکڕایی ٢. دانی باڵدار ☰ ١. تَن؛ کالبد ٢. دانەی پرندە

**لەختولار / lext û lar/**: ئاوەڵناو. لەش‌ولار؛ شل‌ومل ☰ نرم‌اندام رعنا

**لەخرێن / lexrên/**: ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. لەخرێنی؛ لەخورێن؛ لەخورێنی؛ لەرخێنی؛ ناشت؛ هیچ‌نەخواردوو لە پاش لە خەو هەستان ☰ ناشتا؛ صبحانه‌نخورده

**لەخرێنی / lexrênî/**: ☜ لەخرێن

**لەخش / lexş/**: ☜ لەخشە

**لەخشان / lexşan/**: ☜ لەخشین

**لەخشتەبراو / lexişteb(i)raw/**: ئاوەڵناو. فریودراو

▤ فریب‌خورده

**لەخشە** / lexşe/: نـاو. لـەخش؛ خشـکە؛ قنگەخشکێ؛ کاری لە سەر قنگ خزین ▤ عمل بر باسن روی زمین خزیدن

▣ **لەخشە لە خۆ نەخستن:** *[کینایە]* نەجوولان؛ تەکان نەخواردن ▤ جُم نخوردن؛ از جای خود نجنبیدن

**لەخشین** / lexşîn/: چاوگ. لەخشان؛ خشکە کردن بە زەویدا ▤ جنبیدن؛ بر زمین جابەجا شدن

**لەخم** / lexm/: ☜ **لوغم ـ۲**

**لەخواترس** / lex(i)watirs/: ئاوەلـناو. تۆبـەدار ▤ پرهیزگار

**لەخورێن** / lexurên/: ☜ **لەخرێن**

**لەخورێنی** / lexurênî/: ☜ **لەخرێن**

**لەخوم** / lexum/: ناو. هەوسار؛ لەغاو ▤ افسار

**لەخۆبایی** / lexobayî/: ئاوەلـناو. بەدەعیـەـ؛ خۆپەسند؛ گەوەزە ▤ مغرور

**لەخۆبوردو** / lexoburdû/: ئاوەلـناو. خـۆ بـەخت کردوو؛ دەست لە ژیـان بـەرداو؛ گیـان لـە سـەر دەست ▤ ازخودگذشته

**لەخۆبوردویی** / lexoburdûyî/: نـاو. کـار و ڕەوتی چاو لە گیان و مالی خۆ پۆشین، لە بەر کەسێک یان ئامانجێک ▤ ازخودگذشتگی

**لەخۆدەرچو** / lexoderçû/: ئاوەلـناو. بـاغر؛ لەخۆگۆڕاو؛ غلوور؛ بادیهەوا ▤ مغرور

**لەخۆڕا** / le xoṙa/: ئاوەلکار. هـەروا؛ بـە بـێ هـۆ؛ لەگۆترە ‹عەزیزم بۆچی تۆراوی لەخۆڕا؟/ چ قـەوماوە دلی تۆ بۆچی گۆڕا «هێمن»› ▤ بیخود؛ سرخود

**لەخۆڕیاو** / le xoṙyaw/: ئاوەلناو. خوێـڕی؛ خـۆڕی ▤ بیکارە و هرزە

**لەخۆگۆڕاو**/lexogoṙaw/: ئاوەلـناو. غلوور؛ بادیهەوا؛ لەخۆدەرچوو ▤ مغرور

**لەخۆوە** / lexowe/: ئاوەلکار. لـەخۆڕا: ۱. بـە بـێ هیچ؛ بێ هیچ سەبەبێک ‹لەخۆوە هات و لێیدام!› ۲. بە بێ دلـنیایی؛ بـە درۆ ‹لـەخۆوە ئـەو قسـەی کرد› ▤ ۱. بی دلیل ۲. دروغکی

**لەخەمڕستو** / lexemṙistû/: ☜ **لەخەمڕەخساو**

**لەخـەمڕەخسـاو** / lexemṙexsaw/: ئاوەلـناو. لەخەمڕستوو؛ لەخـەمڕەخسـیو: ۱. لـە خـەم بـۆ خواردن ڕزگاربوو ۲. *[کینایە]* پێگەیشتوو؛ گەورەبوو ▤ ۱. بی‌نیاز مراقبت ۲. رشید

**لەخەمڕەخسیو**/ lexemṙexsîw/: ☜ **لەخەمڕەخساو**

**لەداخان** / ledaxan/: ئامراز. لەحـەیف؛ لەحـەیفان ▤ از حسرت

**لەدوای** / led(i)way/: ئامراز. لە پاش ▤ بعد از

**لەدوڕ** / leduṙ/: ئامراز. لە ناوەڕاست ‹ئەوسا خۆشـی چـاوی گێـڕا، لـەدوڕ جەهەندەمـدا دیـتی «هـەژار، قورئان»› ▤ وسط؛ میانِ

**لەدەس** / ledes/: ئامراز. بـەدەس؛ لەدەسـتی ▤ از دستِ

**لەدەستی** / ledestî/: ئامراز. بەدەس؛ لـەدەس ▤ از دستِ

**لەدەف** / ledef/: ئاوەلـناو. خوێـڕی و بێکـارە. هەروەها: **لەدەفی** ▤ هرزەی ولگرد

**لەدەڤ** / ledev/: ئامراز. لجەم؛ لای ▤ نزد؛ پیش

**لەدەم** / le dem/: ئاوەلکار. ۱. نزیک بە؛ لە لای ۲. کـەناری؛ قـەراخی ۳. لـەجێ؛ دەسـبەجێ ▤ ۱. نزدیک به ۲. در لبەی ۳. فوراً

**لەدەما** / ledema/: ☜ **لەدەمدا**

**لەدەمـدا** / ledemda/: ئاوەلـکار. لـەدەما: ۱. دەمێکی؛ ئەو کاتـە ۲. لـەجێ؛ دەسـبەجێ ▤ ۱. وقتی که ۲. فوراً

**لەدەو** / ledew/: ئامراز. لای؛ جەم؛ کن؛ نک ▤ نزدِ

• **لەر** / -ler/: پاشـگر. نیشـانەی کـۆ (**تێبینی:** لـە تورکییەوە هاتووە) ‹گوندی شێخلەر؛ مـیر و بەگلـەر› ▤ ـ ان

**لەران** / leran/: چاوگ. لەرانەوە؛ جوولان بە ڕاست

و چۆپەدا 🇮🇷 جُنبیدن

**لەراندن** / lerandin/: چاوگ. جووڵاندنی بە ڕاست و چۆپەدا 🇮🇷 جُنباندن

**لەراندنــەوە** / lerand(i)newe/: چــاوگ. تێــەڕ. //لەراندتەوە؛ دەلەرێنییــەوە؛ بلەرێنــەوە// لەرانــەوە؛ لەراندن 🇮🇷 جُنباندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەلەراندنەوە

**لەرانەوە** / lerannewe/: ☜ **لەراندنەوە**

**لەرانـەوە** / leranewe/: چـاوگ. تێنەپەڕ. //لەرایـەوە؛ دەلەرییەوە؛ بلەرێوە// لەریان؛ لەریانەوە 🇮🇷 جُنبیدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: لـەراوەوە/ چـاوگی نـەرێنی: نەلەرانەوە

**لەرخێنی** / lerxênî/: ☜ **لەخرێن**

**لەرز**[١] / lerz/: ناو. دقیچە؛ دقیچێ؛ چۆق؛ دۆخ یان چۆنیەتی شەکانەوەی ماسوولکەی لەش زۆرتر بە هۆی سەرما، ترس یان ڕکەوە 🇮🇷 لرز

⊡ **لەرز برین**: [باوەڕی کۆن] دوعا لە مـوو خوێنـدن بۆ لەرز و تا چاک بوونەوە 🇮🇷 دعا بر مـو خوانـدن برای شفای تب و لرز

**لەرز بۆ برین**: [کینایە] ترساندنی زۆر 🇮🇷 ترسانیدن

**لەرز کردن**: ١. تووشی لەرز هاتن ‹سەرەتا لـەرزم کرد و پاشان یاو دەستی پێ کرد› ٢. [کینایە] زۆر سەرما بوون 🇮🇷 ١. لرز کردن ٢. از سرما لرزیدن

**لەرز گرتن**: تووشی تا و لەرز بوون 🇮🇷 دچار تب و لرز شدن

**لەرز لێ هـاتن**: ١. تا گرتن ٢. لەرزین لە ترسان و لە سەرمان ٣. [کینایە] زۆر ترسان لە شتێ یان ڕووداوێ کە جارێ نەهاتووە یان ڕووی نەداوە و بڕیارە بێ 🇮🇷 ١. تـب و لـرز گـرفتن ٢. لرزیـدن از سرما یا ترس ٣. ...

**لەرز**[٢]: ئاوەڵناو. لەڕ؛ لاواز 🇮🇷 لاغر

**لەرزان** / lerzan/: چاوگ. ١. بوومەلەرزە هـاتن ٢. ☜ **لەرزین** 🇮🇷 ١. زلزلە آمدن ٢. ☜ **لەرزین**

**لەرزاندن** / lerzandin/: چاوگ. تێـەڕ. //لەرزانـدت؛ دەلەرزێنی؛ بلەرزێنە// وە لەرزە خستن 🇮🇷 لرزاندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەلەرزاندن

**لەرزاندنـــەوە** / lerzand(i)newe/: چـــاوگ. لەرزانەوە؛ لەرزاندن 🇮🇷 لرزاندن

**لەرزانەوە** / lerzannewe/: ☜ **لەرزاندنەوە**

**لەرزانە** / lerzane/: ناو. ١. خشڵێکی ژنانـە ‹زڕەی لەرزانەی دڵ ئاوەرد وە لەرز/ کلاقەی پێچ پێچ بـالا عەرعەر تەرز «ئەحمەد بـەگی کۆماسـی»› ٢. نـاوی قامێکی کوردییە 🇮🇷 ١. زیوری زنانە ٢. آهنگی است

**لەرزانەوە** / lerzanewe/: ☜ **لەرزین**

**لەرزای** / lerzay/: چاوگ. لەرزان؛ لەرینـەوە ‹پـا دا وە زەمین قۆڕنا وە قین/ جە نەعرەی دەنگش مەلەرزا زەمین «شانامەی کوردی، هەورامی»› 🇮🇷 لرزیدن

**لەرزک**[١] / lerzik/: ناو. ١. زەمـینی زۆنـگ ٢. ☜ **لەرزۆک**[١] 🇮🇷 ١. زمین آبزا ٢. ☜ **لەرزۆک**[١]

**لەرزک**[٢]: ☜ **لەرزۆک**[٢]

**لـەرزکامرنێ** / lerzkamirnê/: نــاو. لنگەفرتــــە؛ پەلەقاژەی سەرەمەرگ 🇮🇷 عمل دست و پا زدن دم مرگ

**لەرزوتا** / lerz û ta/: ناو. تا و لەرز 🇮🇷 تب و لرز

**لـەرزۆک**[١] / lerzok/: نـاو. لـەرزک؛ نەخۆشـییەکی حەیوان کە دەلەرزێ و کتوپڕ دەمـرێ 🇮🇷 نـوعی بیماری دام

**لەرزۆک**[٢]: ئاوەڵناو. لەرزک؛ لەرزەک؛ لەرۆک ‹هەزار دەوران گەڕا مەیگێڕی گـەردوون تـا هـەلێکم هـات/ لەبەر پیری ئەویشی لـێ ڕژانـدم دەسـتی لـەرزۆکم! «هەژار، بۆ کوردستان»› 🇮🇷 لرزان

**لەرزە**[١] / lerze/: ☜ **لەرە**

⊡ **هێنانە لەرزە**: خستنە هەشـەکە؛ ڕاتلـەکاندن و لەراندنەوە 🇮🇷 بە لرزە انداختن

• **لەرزە**[٢]: پاشەوشە. لەرزە؛ شەکە؛ لەخشە ‹دڵەلەرزە؛ دەستەلەرزە› 🇮🇷 ـ لرزە

**لەرزەک**[1] / lerzek/: ناو. ١. بوومەلەرزە ٢. زەمینی ناپتەوی شل ☲ ١. زلزله ٢. زمین سست

**لەرزەک**[2]: ☜ **لەرزۆك**[2]

**لەرزەلەرز** / lerzelerz/: ئاوەڵکار. لەرەلەر؛ لەرزەوە؛ لە حاڵی لەرزیندا ‹لەرزەلەرز بەرەو ئێمە هەنگاوی نا› ☲ لرزان

**لەرزەوە** / lerzewe/: ☜ **لەرزەلەرز**

**لەرزی** / lerzî/: ناو. لەڕی؛ کزی ☲ لاغری

**لەرزیان** / lerzyan/: ☜ **لەرزین**

**لەرزیانەوە** / lerz(i)yanewe/: ☜ **لەرزین**

**لەرزین** / lerzîn/: چاوگ. تێنەپەڕ. //لەرزیت؛ دەلەرزی؛ بلەرزە// لەرزان؛ لەرزیان؛ لەرزانەوە؛ لەرزیانەوە؛ لەرزینەوە؛ لە جێگای خۆوە بە ناویستی و لەپەستا بزوان ☲ لرزیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: لەرزیو/ چاوگی نەرێنی: نەلەرزین

**لەرزینەوە** / lerzînewe/: ☜ **لەرزین**

**ـ لەرزێ** / lerzê/: پاشەوشە. لەرزە؛ شەکە؛ لەخشە ‹نە کۆکەی دەروون، نە هاژەی بەڵغەم/ نە دەستەلەرزێ، نە دیدەی پڕتەم «قانع»› ☲ ـ لرزه

**لەرۆك** / lerok/: ☜ **لەرزۆك**[2]

**لەرە** / lere/: ناو. لرە؛ لەرزە؛ شەکە؛ دەکۆ؛ پارکە؛ لەخشە؛ بەترێ؛ بەلەچە؛ هارەلەقی؛ دۆخی لەرینەوە ‹لەرەی گوارە› ☲ لرزش

**لەرەلەر**[1] / lereler/: ناو. لەرەی زۆر ☲ لرزش بسیار

**لەرەلەر**[2]: ئاوەڵکار. بە لەرزە؛ بە لەرە ☲ لرزان

**لەرەنە** / lerene/: چاوگ. لەرانەدن؛ بزوانەدن ☲ جُنباندن

**لەریانەوە** / leryanewe/: ☜ **لەرینەوە**

**لەریایۆ** / leryayo/: چاوگ. لەرینەوە ☲ جُنبیدن

**لەرین** / lerîn/: ☜ **لەرینەوە**

**لەرینەوە** / lerînewe/: چاوگ. تێنەپەڕ. //لەریتەوە؛ دەلەریەوە؛ بلەرێوە// لەرین؛ لەریانەوە؛ لەرانەوە: ١. لەران ٢. لەرزینەوە ☲ ١. جُنبیدن ٢. لرزیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: لەریوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەلەرینەوە

**لەڕ** / leř/: ئاوەڵناو. لاڕ؛ لاواز؛ داڵگۆشت؛ کز؛ لەجەر ☲ لاغر

◘ **لەڕ بوون**: لاڕ بوون؛ کز بوون؛ لاواز بوون ☲ لاغر بودن

**لەڕ بوونەوە**: گۆشت کەم کردنی لەش ☲ لاغر شدن

**لەڕادەبەدەر**[1] / leřadebeder/: ئاوەڵناو. بێژمار؛ بێشۆ؛ بێشۆ ☲ بیش از حد

**لەڕادەبەدەر**[2]: ئاوەڵکار. بێژمار؛ بێشۆ؛ بێشۆ ‹ئەو کابرایە لەڕادەبەدەر تووڕەیە› ☲ بیش از حد

**لەڕق** / leřiq/: ئاوەڵناو. لەڕک؛ ڕکوونی؛ ڕقلەزگ ☲ کینەتوز

**لەڕک** / leřik/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **لەڕق** ٢. ☜ **لەڕۆك**

**لەڕگ** / leřig/: ☜ **لاشە ـ١**

**لەڕولاواز** / leř û lawaz/: ئاوەڵناو. داڵگۆشت؛ ڕەقەڵە ☲ لاغر

**لەڕۆک** / leřok/: ئاوەڵناو. لەڕک؛ چکۆڵەی لاواز ☲ لاغرک

**لەڕوو** / leřû/: ئاوەڵناو. ١. خوشیک؛ جوانی دڵپەسند ٢. بە قەدر؛ بەڕێز ٣. ڕووبەڕوو؛ بەرانبەر ٤. ڕەپ و ڕاست ‹قسەی لەڕوو› ☲ ١. زیبا ٢. مُحترم ٣. روبەرو ۴. رُک و صریح

**لەڕەبا** / leřeba/: ناو. نەخۆشی ئاوسانی پەز و بزن ☲ بیماری ورم بُز و گوسفند

**لەڕی** / leřî/: ناو. لاڕی؛ کزی؛ لاوازی؛ بێگۆشتی ☲ لاغری

**لەڕێلاداو** / leřêladaw/: ☜ **لەڕێلادەر**

**لەڕێلادەر** / leřêlader/: ئاوەڵناو. لەڕێلاداو؛ ڕەت؛ کلا ☲ منحرف از راه

**لەز** / lez/: ناو. لەز؛ پەلە؛ هەشتاو ☰ شتاب؛ عجله

◘ **لەز کرن**: پەلە کردن ☰ شتاب کردن

**لەزاگ** / lezag/: ناو. تابووت؛ داربەست ☰ تابوت

**لەزالەز** / lezalez/: ئاوەلکار. ١. پەلەپەل ٢. هەر ئێستە ٣. دەسبەجێ ☰ ١. باعجله ٢. هم اکنون ٣. بی‌درنگ

**لەزاندن** / lezandin/: چاوگ. پەلە کردن ☰ شتافتن

**لەزاهی** / lezahî/: ناو. پەلەیی؛ هەڵپە؛ بەلەسەیی ☰ شتاب؛ عجله

**لەزبلەز** / lezbilez/: ئاوەلکار. زۆر بە پەلە ☰ بسیار باعجله

**لەزخۆر** / lezxor/: ئاوەلناو. تایبەتمەندی کەسێ کە بە هەڵپە و پەلە نان دەخوا ☰ ویژگی شخصی که با عجله غذا می‌خورد

**لەزک** / lezk/: ☜ **لەزگ**

**لەزکانی** / lezkanî/: ئاوەلکار. بە پەلە؛ بلەز ☰ باعجله

**لەزکی** / lezkî/: ئاوەلکار. خێرا؛ دەسبەجێ ☰ فوراً؛ بی‌درنگ

**لەزگ** / lezig/: ئاوەلناو. لەزِک: ١. بە خەیال لێبڕاو ٢. خەریک؛ سەرقاڵ ☰ ١. مُصمم ٢. سرگرم و مشغول

◘ **لەزگ بون**: ١. پەلە کردن ‹لەزگ بووم بچم› ٢. سەرقاڵ بوون ‹گورگ لەزگ بوو دەیخوارد› ☰ ١. شتاب کردن ٢. سرگرم بودن

**لەزگە** / lezge/: ناو. مشەمما؛ چەسپی بە پێستەوە لکاندن بۆ دەرمان ☰ پلاستر؛ مُشمع طبی

**لەزگین** / lezgîn/: ئاوەلناو. ١. ڕووخۆش؛ ناوچاو ڕۆشن ٢. بەدەستوبرد؛ چالاک و بەکار ☰ ١. خوشرو ٢. چالاک و کاری

**لەزلەز** / lezlez/: ناو. پەلەپەل ☰ عجله

**لەزم** / lezm/: ناو. ١. شە؛ تەڕایی ٢. قوڕ و چلپاو ☰ ١. نم؛ رطوبت ٢. لای و لجن

**لەزمە** / lezme/: ناو. بارانی بەتەوژم ☰ رگبار

**لەزوبەز** / lez û bez/: ئاوەلکار. زۆر بە پەلە ☰ بسیار با عجله

**لەزە** / leze/: ناو. هەرا و کێشە ☰ جاروجنجال

**لەزەبر** / lezebr/: ئاوەلناو. برە؛ لێهاتوو؛ تیژ ☰ کارا

**لەزەت** / lezet/: ناو. خۆشی ☰ لذّت

**لەزەی** / lezey/: ئاوەلکار. بە پەلە؛ بلەز ☰ با عجله

**لەزیز** / lezîz/: ئاوەلناو. ١. بەتام و دڵپەسند ٢. زرنگ ☰ ١. لذت‌بخش ٢. باهوش

**لەزین** / lezîn/: چاوگ. پەلە کردن ☰ شتافتن

**لەژ** / lej/: ☜ **لەز**

**لەژان** / lejan/: ئاوەلناو. بەئازار؛ بەژان ☰ دردناک

**لەژگ** / lejg/: ناو. پەل؛ لق ☰ شاخه

**لەژم** / lejm/: ناو. لەزم؛ قوڕ و چلپاو ☰ لای و لجن

**لەژماربەدەر** / lej(i)marbeder/: ☜ **لەژمارەبەدەر**

**لەژمارەبەدەر** / lej(i)marebeder/: ئاوەلناو. لەژماربەدەر؛ زێدە لە بژاردن؛ یەکجار زۆر ‹ئەستێرەی لەژمارەبەدەر› ☰ بیشُمار؛ بیش از حد

**لەژێلا** / lejêła/: ئاوەلکار. لە خوارەوە بۆ سەر ‹لەژێلا گاران هاتەوە بۆ دێ› ☰ از پایین به بالا

**لەس** / les/: ☜ **لەش ـ١**

**لەسار** / lesar/: ☜ **لاسار**

**لەسپێت** / lespêt/: ناو. بیچم؛ تەحر؛ تەرز ☰ قیافه؛ شکل

**لەسم** / lesm/: ☜ **لەمس[٢]**

**لەسەر[١]** / leser/: ناو. باقی؛ زێدە ماڵێک کە لە گۆڕینەوەدا دەدرێ بە خاوەنی ماڵە باشترەکە ☰ باقی

**لەسەر[٢]**: ئاوەلناو. ١. بالاتر؛ سەرتر ٢. لەپێش؛ لەبەر ٣. ☜ **لاسار** ☰ ١. اعلی؛ بلندمرتبه ٢. در صدر؛ در رأس ٣. ☜ **لاسار**

**لەسەر[٣]**: ئامراز. ١. بە بۆنی؛ بە بۆنەی ‹لەسەر تۆم

دژمنە دنیا، قەزییەم مانیعولجەمعە/ کە تەرکی تۆ
نەکەم تەرکی هەموو دنیا نەکەم چ بکەم؟ «مەحوی»›
٢. عۆدەی؛ لە پای ‹ئەم کارە لەسەر من› ٣.
پێویست ‹لەسەرمە دەبێ بچم› ٤. لایەنگر و
پشتیوان ‹مەترسە من لەسەر تۆم› ٥. لە ڕووی؛ لە
بان ‹لەسەر کێو› ■ ١. از برای؛ به خاطرِ ٢. به
عهده‌ی ٣. بر عهده‌ی ۴. طرفِ ۵. رویِ؛ بالای

**لەسەرچوو** / leserçû/: ناو. سەهو؛ نەزانست؛ هەڵە
■ اشتباه

**لەسەرچە** / leserçe/: ☜ **لەسەرچی**

**لەسەرچی** / leserçî/: ئاوەڵکار. لەسەرچە؛ بۆچی
‹چاوی خوێنین غەرقی پەروین بوو لە بێ‌مێهریی
گوڵم/ مات و حەیرانم لەسەرچی ماهی تابانم نەهات؟
«وەفایی»› ■ چرا؛ به چه خاطر

**لەسەرخۆ**[١] / leserxo/: ئاوەڵناو. ڵسەرخۆ؛
لەسەرەخۆ: ١. ئارام؛ هێدی؛ بەپشوو ٢. بە هۆش؛
ئاگادار ■ ١. آرام ٢. هُشیار

**لەسەرخۆ**[٢]: ئاوەڵکار. ڵسەرخۆ؛ لەسەرەخۆ؛ سەبر؛
نە بلەز؛ هێواش؛ بە ئەسپایی ■ یواش

**لەسەرخۆچوو** / leserxoçû/: ئاوەڵناو. بێ‌سەرودەر؛
بووراو؛ بێ‌هۆش ■ بیهوش

**لەسەرخۆیی** / leserxoyî/: ناو. ئارامی؛ پشوودرێژی
‹ئەم قورعانەش بە لەسەرخۆیی بخوێنە و بە ڕەوانی
... «هەژار، *قورئان*»› ■ آرامی؛ شکیبایی

**لەسەردا** / leserda/: ☜ **لەسەرڕا**

**لەسەردەستان** / leserdestan/: ئاوەڵناو. ١. زگ‌پڕی
لە سەروبەندی زان ٢. *[کینایە]* بڕەودار؛ بەبرەو؛
لەباو ■ ١. آبستن نزدیک به زایمان ٢. رایج

**لەسەرڕا** / leserřa/: ئاوەڵکار. لەسەردا؛ لەسەرەوە:
١. ژ نوو ‹نەقلەکەم لەسەرڕا بۆ گێڕانەوە، ژنەکان
تێکڕا گوتیان: ئەیەڕۆ، چ خێر بوو، بۆ کافرستانیە؟!
«هێمن»› ٢. لە سەرەوە؛ لە بانەو ‹ئاوی گەرمی
داتوڵێنیان لەسەرڕا بە سەردا دەکرێ «هەژار،
*قورئان*»› ■ ١. از نو ٢. از بالا

**لەسەرڕۆیی** / leserřoyî/: ناو. درێژە؛ ترەک؛ کار و
ڕەوتی شوێن کەوتنی کارێ ■ ادامه

**لەسەرقەراخ** / leserqerax/: ☜ **لەسەرقەراغ**

**لەسەرقەراغ** / leserqerağ/: ناو. لەسەرقەراخ؛
بەرداشی لاسواو ■ سنگ آسیاب کناره ساییده

**لەسەرگرێ** / leserg(i)rê/: ناو. بەرداشی ناوەڕاست
زەق ■ سنگ آسیاب وسط برجسته

**لەسەرگرێو** / leserg(i)rêw/: ناو. کاری گرۆ کردن؛
گرێو کردن ■ شرطبندی

**لەسەرلا** / leserla/: ئاوەڵناو. تیلاوتیل؛ خوارەخوار
■ کج؛ اُریب

**لەسەرەخۆ** / leserexo/: ☜ **لەسەرخۆ**

**لەسەرەو** / leserew/: ☜ **لەسەرڕا**

**لەسەرهەست** / leserhest/: ئاوەڵناو. بەهەست؛ قوت؛
گۆبەل؛ گوێ‌قوڵاخ؛ هشیار؛ وازر ■ بااحساس

**لەسەریەک**[١] / leseryek/: ئاوەڵناو. لکاو؛ پەیوەست
‹کاری لەسەریەک› ■ پیوسته

**لەسەریەک**[٢]: ئاوەڵکار. پەیتا ـ پەیتا؛ بێ‌پسانەوە
‹لەسەریەک تەقەیان دەکرد› ■ پیاپی؛ بدون وقفه

**لەش** / leş/: ناو. ١. لەس؛ بەدەن؛ تەن؛ کەلەخ؛
قالب ‹لەش بە ئومێد و زەوی بە باران «مەسەل»›
٢. کێشە و هەرا ٣. *[مەجاز]* شەرمی ژن ‹لەشت بە
دەرەوەیە!› ٤. *[مەجاز]* حەوسەڵە ‹لەشم نییە پام
بشۆم› ■ ١. تن ٢. جاروجنجال ٣. شرمگاه زن ۴.
حال و حوصله

⊡ **لەش بوونە مل**: *[مەجاز]* زۆر ناساغ/ نەخۆش بوون
■ سخت بیمار بودن

**لەش بەبار بون**: *[کینایە]* نەخۆش بوون ■ بیمار
بودن

**لەش پیس/ چەپەڵ بون**: *[کینایە]* غوسڵ لەسەر
بوون ■ جُنُب بودن

**لەش ساق/ ساغ بون**: سەلامەت بوون ■ سالم

بودن

**لەش سوک بون**: /کینایە/ زیرەک و ئازا بوون ▤ زبروزرنگ بودن

**لەش قورس بون**: /کینایە، پلار/ تەمبەڵ و تەوەزەل بوون ▤ تنبل بودن

**لەش نەبون**: تاقەت و هێز نەبوون ‹لەشی نییە لە جێ خۆی هستێ!› ▤ حال و حوصله نداشتن

**لەش‌بەبار** / leşbebar/: ناوەڵناو. دەردەدار؛ لەشەبەبار؛ نەخۆش ▤ بیمار

**لەش‌بەباری** / leşbebarî/: ناو. نەخۆشی؛ ناساخی ▤ بیماری

**لەش‌بەدۆشاو** / leşbedoşaw/: ناوەڵناو. /کینایە/ نازنازی ▤ نازک‌نارنجی

**لەشپۆش** / leşpoş/: ناو. سەرناز؛ خومام ▤ سرانداز

**لەشپیس** / leşpîs/: ناوەڵناو. /کینایە/ لەش‌چەپەڵ؛ غوسڵ لە سەر ▤ جُنُب؛ جنابتدار

**لەش‌چەپەڵ** / leşçepeł/: ☜ **لەش‌پیس**

**لەشخۆر** / leşxor/: ☜ **لاشخۆر-١**

**لەش‌ساخ** / leşsax/: ☜ **لەش‌ساغ**

**لەش‌ساغ** / leşsağ/: ناوەڵناو. لەش‌ساق؛ لەش‌ساخ؛ سەلامەت ▤ سالم؛ تندرست

**لەش‌ساغی** / leşsağî/: ناو. لەش‌ساقی؛ بێنزەرەتی؛ دۆخی نەبوونی نەخۆشی ‹پیرە، بەلام لەو پەڕی لەش‌ساغیدایە› ▤ سلامت؛ تندرستی

**لەش‌ساق** / leşsaq/: ☜ **لەش‌ساغ**

**لەش‌ساقی** / leşsaqî/: ☜ **لەش‌ساغی**

**لەش‌سڤک** / leşsivik/: ☜ **لەش‌سوک**

**لەش‌سوک** / leşsûk/: ناوەڵناو. /مەجاز/ لەش‌سڤک؛ ئازا لە کار؛ دژی تەپ و تەمەڵ ▤ چُست و چابک

**لەش‌شور** / leşşûr/: ناو. مردووشۆر؛ مردەشۆر ▤ مُردەشور

**لەش‌قورس** / leşqurs/: ناوەڵناو. /مەجاز/ لەشگران؛ لەشە؛ تەمەڵ ▤ تنبل؛ گرانخیز

**لەشکر** / leşkir/: ناو. لەشکەر؛ سپا؛ کۆمەڵێکی زۆر لە چەکداران ▤ لشکر

**لەشکربەز** / leşkirbez/: ناو. ئۆردووبەز؛ جێگەی سانەوەی لەشکر لە شوێنێ ▤ جای اُتراق لشکر

⊡ **لەشکربەز کردن**: دابەزین و سانەوەی لەشکر لە شوێنێ ▤ اتراق کردن لشکر

**لەشکربەزێن** / leşkirbezên/: ناوەڵناو. /کینایە، پلار/ ژنی بێ‌حەیای زمان‌درێژ ▤ سلیطه

**لەشکرشکێن** / leşkirş(i)kên/: ناوەڵناو. شەڕکەری پاڵەوان و زۆر ئازا ▤ لشکرشکن

**لەشکرکێشی** / leşkirkêşî/: ناو. سپاڕانی ▤ لشکرکشی

**لەشکرگا** / leşkirga/: ناو. جێگەی لەشکر؛ بنکەی سپا ▤ لشکرگاه

**لەشکری**[١] / leşk(i)rî/: ناو. ١. چەکدارێ کە دەگەڵ لەشکرە ٢. قامێک و بەیتێکی بەناوبانگی مووسیقای کوردە ▤ ١. لشکری ٢. آهنگ و ترانه‌ای مشهور در موسیقی کردی

**لەشکری**[٢]: ناوەڵناو. تایبەت بە لەشکر ‹جل‌وبەرگی لشکری› ▤ ویژەی لشکر

**لەشکوژ** / leşkuj/: ناوەڵناو. لەنێوبەری لەش ‹بە هەر دوو دوژمنی خوێنمژ/ بە گشت چەکی لەش‌کوژ، بیرکوژ «گۆران»› ▤ مُهلک

**لەشکۆڵی** / leşkołî/: ناو. توێکاری؛ تەنکۆڵی ▤ کالبدشکافی

**لەشکەر** / leşker/: ☜ **لەشکر**

**لەشگران** / leşg(i)ran/: ☜ **لەش‌قورس**

**لەشگرانی** / leşg(i)ranî/: ناو. تەمەڵی؛ سستی؛ قۆنەقۆن ▤ تنبلی

**لەشگرس** / leşgirs/: ناوەڵناو. زەلام و ئەستوور ▤ تنومند

**لەش‌لەمل** / leşlemil/: ناوەڵناو. /کینایە/ تەمەڵ؛ تەمبەڵ ▤ تنبل

**لەشماڵێن / leşmałên/:** ناو. قەماڵ؛ لەشوڵێن ☰ ماساژور

**لەشنازک / leşnazik/:** ئاوەڵناو. نازکەک؛ هنەف؛ ناسکەنام ☰ نازکاندام

**لەشناسک / leşnasik/:** ئاوەڵناو. هنەف؛ ناسکەنام؛ نازکەک ‹لەشناسک و لاوچاکی وەها هەن، کچ و کوڕ/ گوڵ دڕکە بەرانبەری بکەی، بێکەسە دوڕ «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ☰ نازکاندام

**لەشنەرم / leşnerm/:** ئاوەڵناو. نەرمونیان؛ نەرمە؛ نەرموشل ☰ طنّاز

**لەشولار / leş û lar/:** ☜ **لەختولار**

**لەشوڵێن / leşw(i)łên/:** ناو. قەماڵ؛ لەشماڵێن ☰ ماساژور

**لەشە / leşe/:** ☜ **لەشقورس**

**لەشەبەبار / leşebebar/:** ☜ **لەشبەبار**

**لەشی / leşî/:** ئاوەڵناو. فیزیکی؛ فیزیایی؛ جەستەیی ☰ فیزیکی؛ بدنی

**لەعاست / le'ast/:** ☜ **لەحاست**

**لەعاستی / le'astî/:** ☜ **لەحاست**

**لەعان / le'an/:** ☜ **لەحاست**

**لەعاند / le'and/:** ☜ **لەحاست**

**لەعل / le'l/:** ناو. لاڵ؛ بەردێکی بەقیمەتە ☰ لعل

**لەعلە / le'le/:** ناو. لالە؛ جێ شەمی بەشیشە ☰ لالە

**لەعنەت / le'net/:** ناو. نفرین؛ نفر؛ تووک؛ نووەڕ؛ بێبەشی لە بەزەیی ☰ لعنت

**لەعنەتی / le'netî/:** ئاوەڵناو. بێبەش لە بەزەیی ☰ لعنتی

**لەعەیبەتان / le'eybetan/:** ئاوەڵکار. لەحەیوەت؛ لەحەیوەتا؛ لەحێوەت؛ لەحێوەتا؛ لەبەر سام و ترس ‹لەعەیبەتان زاری بەسرا و هیچی پێ نەگوترا› ☰ از ترس

**لەعین[١] / le'în/:** ناو. سەرناوە بۆ شەیتان ☰ لقب شیطان

**لەعین[٢]:** ئاوەڵناو. *[کینایە]* تووک لێ کراو؛ لە بەزەیی بێبەش بوو ☰ نفرین شده

**لەغاو / leğaw/:** ناو. لخاف؛ لغاو؛ لغاف؛ لقاو؛ لەخاف؛ لەخاڤ؛ لەقاو؛ لیغاب؛ لیوان؛ هەوساری لە چەرم و ئاسن بۆ ئەسپ لە سواریدا ☰ لگام

⊡ **لەغاو کردن:** ١. هەوسار کردن ٢. *[کینایە]* هاوردنە ژێر ڕکێفی خۆ ‹نەوسی خۆ لەغاو کە› ☰ ١. افسار زدن ٢. در کنترل خود گرفتن

**لە قنگەوە لەغاو کردن:** *[کینایە، شوورەیی]* کاری پێچەوانە و دوور لە مەبەست کردن ☰ کار وارونە کردن

**لەغاوە / leğawe/:** ناو. لالغاوە؛ لالەغاوە؛ لغاوە؛ لالیچ؛ قەراغی دەم؛ سووچی زار ☰ گوشەی دهان

**لەغاوەبرکە / leğawebiřke/:** ☜ **لەغاوەبڕکێ**

**لەغاوەبڕکێ / leğawebiřkê/:** ناو. لغاوبڕە؛ لغاوەبڕکێ؛ لغاوەبڕێ؛ لەغاوەبڕکە؛ لەغاوەبڕێ؛ نەخۆشی برینداربوونی سووچی دەم ☰ زخم گوشەی دهان

**لەغاوەبڕێ / leğaweb(i)řê/:** ☜ **لەغاوەبڕکێ**

**لەغرو / leğrû/:** ناو. ڕیخۆڵە؛ ڕۆخڵە ☰ رودە

**لەغم / leğim/:** ☜ **لوغم**

**لەغمە / leğme/:** ☜ **لوغم ـ١**

**لەغەر / leğer/:** ئاوەڵناو. لەجەر؛ لاواز؛ کز؛ دالگۆشت ☰ لاغر

**لەغەز / leğez/:** ☜ **لەگەز**

**لەغەم / leğem/:** ☜ **لوغم ـ١**

⊡ **لەغەم لێ دان:** ڕێ کۆڵین بە بن عەرزا ☰ تونل زدن

**لەف / lef/:** ناو. ١. قوویت؛ قووت ٢. پێچ ٣. پێل؛ شەپۆل ☰ ١. بلع ٢. پیچ ٣. موج

⊡ **لەف دان:** قووت دان بە یەک جار ☰ یکبارە بلعیدن

**لەفافە** / lefafe/: ناو. پەڕۆ یان هەر شتێ کە دە شتێکیەوە دەپێچن ☰ لفافە

**لەففە** / leffe/: ☜ لەفە

**لەفونەشر** / lef û neşr/: ناو. پێچەوپەخشە؛ هێنانی دوو یان چەن وشە لە شوێنێک (لەف: پێچە) و دوو یا چەن وشەی تری سەر بەوان (نەشر: پەخشە) لە شوێنێکی‌تر (وەک دەڵێ: «هێز و سۆمای نییە باڵ و چاوم» یانێ: باڵم هێزی نییە، چاوم سۆمای نییە) ☰ لف‌ونشر

**لەفە** / lefe/: ناو. لەففە؛ بابۆڵە ☰ ساندویچ

**لەفین** / lefîn/: چاوگ. شۆڕ بوونەوە ☰ فروهشته شدن

**لەڤ**[1] / lev/: ناو. لڤ؛ جووڵە؛ بزاو ☰ حرکت

**لەڤ**[2]: ئامراز. پێک؛ لێک ☰ با هم

◘ **لەڤئانین**: ئاشتەوە کردن؛ پێک‌هێنان ☰ آشتی دادن

**لەڤخستن**: ١. لە یەکتر دان ٢. وێک‌کەوتن؛ بە یەکەو تەقیان ☰ ١. همدیگر را زدن ٢. بە هم اصابت کردن

**لەڤا دان**: بەش ـ بەش بوون ☰ تقسیم شدن

**لەڤهاتن**: پێکهاتن؛ سازان ☰ با هم کنار آمدن

**لەڤا** / leva/: ناو. بەش؛ پار؛ پشک ☰ سهم؛ حصە

◘ **لەڤا کرن**: بەش ـ بەش کردن ☰ تقسیم کردن

**لەڤەن** / leven/: ناو. لەوەن؛ جۆرێ قامیشی باریک ☰ نوعی نی باریک

**لەڤەند** / levend/: ئاوەڵناو. لەوەند؛ خۆرتی شۆخ و جوان؛ لاوی جوانچاک و بڵندبالا ☰ جوان رعنا و زیباروی

**لەڤەندی** / levendî/: ناو. لەوەندی؛ ئەنگوچکەی سۆرانی ☰ آستین بُلند

**لەڤین** / levîn/: چاوگ. لڤین؛ بزووتن؛ جوولان ☰ جُنبیدن

**لەق**[1] / leq/: ناو. ١. لق؛ لک ٢. قەپ؛ گاز ٣. لۆق؛ هێلکەی گەنیو ٤. لۆمە؛ سەرکۆنە ٥. حەنەک؛ گاڵتە ☰ ١. شاخە ٢. گاز دندان ٣. تخم‌مرغ فاسد ۴. سرزنش ۵. شوخی؛ مزاح

**لەق**[2]: ئاوەڵناو. لۆق؛ لەوار؛ لەق و لەوار؛ شەق؛ بن‌سست؛ بە حاڵەت یان دۆخی ناقایم و لەرزۆک ‹ددانی لەق› ☰ لَق

◘ **لەق کردن**: شل کردن و لە جێگەی خۆی بزواندن ☰ لق کردن

• **لەق**[3]: پاشەوشە. شۆڕ ‹گوێ‌لەق› ☰ فروهشته

**لەق**[4]: پێرۆ. ← تەق‌ولەق ـ شەق و لەق

**لەقا** / leqa/: ناو. بەرەکەت ☰ برکت

◘ **لەقا لێ‌خستن**: ١. بەرەکەت تێ‌خستن؛ بەرەکەتدار کردن ‹ئەم خەرمانە خوا لەقای لێ‌خستگە› ٢. جوان و ڕازاوە ئافراندن ☰ ١. بابرکت کردن ٢. زیبا و چشم‌نواز آفریدن

**لەقان** / leqan/: چاوگ. تێنەپەر. //لەقای؛ دەلەقێی؛ بلەقێ// لەقین؛ شل بوون و لەرزین لەبەر بن‌سستی ☰ لق شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: لەقاو/ چاوگی نەرێنی: نەلەقان

**لەقاندن** / leqandin/: چاوگ. تێپەر. //لەقاندت؛ دەلەقێنی؛ بلەقێنە// لەقانن: ١. شل و سست کردن و لەراندن ‹ئەوەندەت لەقاند دەرهاتا› ٢. داڵەقاندن؛ شۆڕ کردنەوە ٣. هەڵاوسین ٤. ڕاژەندن ‹چکێ ئەو بێشکە بلەقێنە› ☰ ١. تکان دادن و لق کردن ٢. فروهشتن ٣. آویختن ۴. تکان دادن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەلەقاندن

**لەقاندنەوە** / leqand(i)newe/: چاوگ. لەرزاندنەوە؛ شەکاندنەوە ☰ تکان ـ تکان دادن

**لەقانن** / leqanin/: ☜ لەقاندن

**لەقاو**[1] / leqaw/: ☜ لەغاو

**لەقاو**[2]: ئاوەڵناو. ١. لە جێگە لەرێندراو ٢.

شۆڕەوەکراو؛ داهێڵراو ☰ ١. لق‌شده ٢. فروهشته

**لـەقاودان** / leqawdan/: چـاوگ. دەرخسـتن؛ ئاشکرا کردن ☰ افشا کردن

**لـەقاودراو** / leqawd(i)raw/: ئاوەڵـناو. زڕیـان؛ دەرکەوتن؛ ئاشکرا بوون ☰ افشاشده

**لـەقاودەر** / leqawder/: ئاوەڵـناو. ئاشـکراکەر؛ دەرخەر ‹ماڵـپەڕی لـەقاودەری «ویکیلیکس»› ☰ افشاگر

**لـەقلۆق** / leqloq/: نـاو. ١. ☜ **لۆقـە**[1] ٢. قـەترە؛ قۆرتە ☰ ١. ☜ **لۆقە**[1] ٢. اسب یورتمه

**لەقلەق** / leqleq/: ☜ **لەگلەگ**

**لەقلەقە** / leqleqe/: ناو. جۆرێ ڕێـواس ☰ نـوعی ریواس

**لەقلەقی**[1] / leqleqî/: نـاو. جـۆرێ تـرێ ☰ نـوعی انگور

**لەقلەقی**[2]: ئاوەڵناو. باریکی لنگ‌درێـژی تەنبـەڵ ☰ لنگ‌دراز تنبل

**لەقم** / leqim/: ناو. لەقەم؛ کاری بنکۆڵی و گڵ وە سەر لاسک دان ☰ عمل کندن و خاک بر ساقەهـا ریختن

⊡ **لـەقم کـردن**: لەقـەم کـردن؛ شـکاندنەوەی شینایی؛ بنکۆڵی و گـڵ وە سـەر لاسـک دانی شینایی هاوینە ☰ کندن پیرامون بوتەهای پالیزی و خاک ریختن بر ساقەها در فصل تابستان

**لەقماڵ** / leqmał/: ناو. گاسنێ کە لە ناو دەنـدەی شل دایە و دەلەقێ ☰ گاوآهنی کە در خیش مُحکم نیست

**لەق‌وشەق** / leq û şeq/: ☜ **لەق‌ولۆق**

**لـەق‌ولۆق** / leq û loq/: ئاوەڵـناو. لـەق‌ولـەوار؛ تەق‌ولەق؛ شل‌وشەوێق؛ لـەق‌وشـەق؛ لـەق‌وپـەق ترغەڵ ‹تەختەخەوێکی لەق‌ولۆقیان پێ دام کە هـەر دەترسام بشکێت و بەربیمەوە!› ☰ لق‌ولوق

**لەق‌ولەوار** / leq û lewar/: ☜ **لەق‌ولۆق**

**لەقە** / leqe/: ناو. ١. لاقە؛ کاری توند ئاویتنی پـا؛ ڕاوەشاندنی پێ ٢. کاری لە جێ بـزووتن ٣. ☜ **لەقەب** ☰ ١. لگـد ٢. عمـل از جـا جُنبیـدن ٣. ☜ **لەقەب**

⊡ **لەقە لە ئاسمان دان**: ☜ **لەقە لە با دان**

**لەقە لە با دان**: *[مەجاز]* لەقە لە ئاسمان دان؛ زۆر تووڕە بوون ‹وا تووڕە بوو لەقەی لـە بـا دەدا!› ☰ بسیار عصبانی شدن

**لەقە وەشاندن**: لەقە وەشـانن؛ لەقـە هاویشـتن؛ لاق بە توندی ڕاوەشاندن ☰ لگد زدن

**لەقە وەشانن**: ☜ **لەقە وەشاندن**

**لەقە هاویشتن**: ☜ **لەقە وەشاندن**

**لەقەب** / leqeb/: ناو. لەقە؛ لەقەم؛ جێ‌ناو؛ سەرناو؛ ناوێ کە لـە جیـاتی نـاوی بنچینـەیی بـۆ شـتێ داندرابێ ☰ لقب

**لەقەبـەڵ** / leqebeł/: ئاوەڵـکار. مەختـە؛ قەبـەڵ؛ کونتەراتی؛ کاری گـرتن و سـپاردنی کارێـک بـە مـەرجی تـەواو بـوون و یـەکجێ کـرێ دانی ☰ کُنتراتی

**لەقەدەر** / leqeder/: ئامراز. بەقەدەر؛ بە ئەنـدازەی ☰ به مقدارِ

**لەقەرە** / leqere/: ☜ **لەتەرە ـ٢**

⊡ **لەقەرە دان**: ☜ **لەتەرە دان**

**لەقەست**[1] / leqest/: ئاوەڵناو. دەسقەس؛ ئەنقەسـت ‹کاری لەقەست› ☰ عمدی

**لەقەست**[2]: ئاوەڵکار. لەقەستی: ١. بـە ئاگـاداری؛ ژ دل ‹لەقەست وا دەکا› ٢. بـۆ گاڵـتە و گەمـە؛ نـە بەڕاستی و ژدڵ ☰ ١. عمداً ٢. از سرِ شوخی

**لەقەستی** / leqestî/: ☜ **لەقەست**[2]

**لەقەشێل** / leqeşêl/: ناو. کاری بـە تـەوژم بـەرپێ دان ☰ لگدکوب

**لەقەفرتێ** / leqefirtê/: ☜ **لاقەفرتێ**

**لەقەفرە** / leqef(i)iře/: ☜ **لاقەفرتێ**

**لەقەفە / leqefe/**: ناو. ڕکە؛ قەفەس 🇮🇷 قفس

**لەقەل / leqel/**: ناو. قامیش؛ چیتک؛ چیت 🇮🇷 نی

**لەقەلەق[1] / leqeleq/**: ناو. ١. چۆنیەتی بزووتن بەولاولادا ٢. *[کینایە]* دژواری و زەحمەت 🇮🇷 ١. لِکولِک ٢. دشواری

**لەقەلەق[2]**: ئاوەڵکار. ١. شەلەشەل؛ لارەلار ‹لەقەلەق هاتە لام› ٢. هێواش ـ هێواش؛ بە هێواشی و شلی ‹ئێوە لەقەلەق بڕۆن! منیش دێم› 🇮🇷 ١. لنگ‌لنگان ٢. آرام‌ـآرام

**لەقەم / leqem/**: ناو. ١. 👈 لەقم ٢. 👈 لەقەب ٣. سەرکۆنە؛ لەگەز ‹هەرچەند خۆش ڕابوێرن کەمە/ چ ڕۆژی لۆمە و لەقەمە «هەژار، بۆ *کوردستان*»› ٤. تەوس؛ تانە 🇮🇷 ١. 👈 لەقم ٢. 👈 لەقەب ٣. سرزنش ٤. طعنه

▣ **لەقەم کردن**: 👈 لەقم کردن

**لەقەم گرتن**: تانە دیتنەوە؛ ئیراد گرتن 🇮🇷 ایراد گرفتن

**لەقەماڵ / leqemał/**: ناو. پاشێل؛ پاکوت؛ پێشێل 🇮🇷 لگدمال

**لەقەوەشێن / leqeweşên/**: ئاوەڵناو. لەقەهاوێژ؛ جووتەوەشێن 🇮🇷 لگدپران

**لەقەهاوێژ / leqehawêj/**: 👈 لەقەوەشێن

**لەقی / leqî/**: ناو. دۆخ یان چۆنیەتی لەق بوون 🇮🇷 لقی

**لەقیسچو / leqîsçû/**: 👈 لەکیسچو

**لەقین / leqîn/**: 👈 لەقان

**• لەقێن / leqên-/**: پاشەوشە. ـ بزوێن ‹گوێ‌لەقێن› 🇮🇷 جُنباننده

**لەک / lek/**: ناو. ١. هۆزێکی کورد لە باشووری کوردستان ٢. *[کینایە]* سەدهەزار ‹لە گاوان و شوانی کوردەکان یەک/ بەسە بۆ لەشکری سەد کەڕەڕە دوو لەک «حاجی قادر»› ٣. پەڵە؛ پنوو ‹لەک گرتن› 🇮🇷 ١. لک؛ عشیره‌ای در جنوب کردستان ٢. صدهزار ٣. لکّه

**لەکاتە / lekate/**: ناو. گوڵچنی؛ گوڵە دەغڵی لە داس‌پەڕیو کۆ کردنەوە 🇮🇷 خوشه‌چینی

**لەکار / lekar/**: ئاوەڵناو. ١. بەدەست و لەبرەو ٢. بەکار؛ کار لێ هاتوو ٣. بەکار؛ بەکەڵک؛ شیاوی کەڵک لێ وەرگرتن 🇮🇷 ١. دست‌اندرکار ٢. کارامد ٣. کاربردی

**لەکارتە / lekarte/**: ئاوەڵناو. لەکارکەوتە؛ پەک‌کەوتە 🇮🇷 لکنته؛ ازکارافتاده

**لەکاردەرهاتگ / lekarderhatig/**: 👈 لەکاردەرهاتو

**لەکاردەرهاتو / lekarderhatû/**: ئاوەڵناو. کارامە؛ لەکاردەرهاتگ 🇮🇷 ماهر؛ کارآزموده

**لەکارزان / lekarzan/**: ئاوەڵناو. کارزان 🇮🇷 کاردان

**لەکارکەفتگ / lekarkeftig/**: 👈 لەکارکەوتە

**لەکارکەوتو / lekarkewtû/**: 👈 لەکارکەوتە

**لەکارکەوتە / lekarkewte/**: ئاوەڵناو. لەکارکەفتگ؛ لەکارکەوتوو؛ لەکارتە 🇮🇷 ازکارافتاده

**لەکارهاتو / lekarhatû/**: ئاوەڵناو. چووختی؛ مەزبووت؛ وریا 🇮🇷 چُست و چالاک

**لەکڕ / lekiř/**: ئاوەڵناو. ئەبلەق؛ بازگ 🇮🇷 ابلق

**لەککاتە / lekkate/**: ئاوەڵناو. لەیلەدۆنێ؛ خوێنەونێرە؛ خوێنەونەرە؛ سەڵیتە؛ قەرەچی؛ بێشەرمی شەڕانی (بۆ ژن) 🇮🇷 لکّاته

**لەککە / lekke/**: ناو. قانی؛ پەڵە 🇮🇷 لکه

**لەکگر / lekgir/**: ئاوەڵناو. ڕەشی مل سپی (ئاژەڵ) 🇮🇷 سیاهِ گردن سفید (بُز و گوسفند)

**لەکلەک / leklek/**: 👈 لەگلەگ

**لەکم / lekm/**: ناو. پنۆک؛ لەک؛ پەڵە 🇮🇷 لکّه

**لەکمات / lekmat/**: ناو. زللە؛ شەقام؛ شەقەزلە 🇮🇷 سیلی

**لەکماتک / lekmatik/**: ناو. سەرناو؛ لەقەب 🇮🇷 لقب

**لەکن / lekin/**: ئامراز. لە لای 🇮🇷 نزدِ

**لەکورتی / lekurtî/**: ئاوەڵکار. بێدرێژەدان بە قسە

‹قسەکانم لەکورتی ئەبڕمەوە› ☰ بە اختصار

**لەکوشەک** / lek û şek/: ناو. بزاڤ؛ بزاو؛ جوولـە ☰ تکان

**لەکوڵ** / lekuł/: ئاوەڵناو. لە حاڵی کوڵداندا ‹بلبلـی باڵ شکاوی وەختی گوڵم/ هەر شـەپۆلان دەدا دڵـی لەکوڵم «هێمن»› ☰ جوشان

**لەکوێ** / lekwê/: ئاوەڵکار. لەکوێڕا؛ لەکوو؛ لەکووڕا ☰ کجا

**لەکوێڕا** / lekwêřa/: ☜ لەکوێ

**لەکۆلەڕۆ** / lekoleřo/: نـاو. تووک و نزای خراپ ☰ نفرین

**لەکوو** / lekû/: ☜ لەکوێ

**لەکووڕا** / lekûřa/: ☜ لەکوێ

**لەکە** / leke/: ناو. پۆک؛ پەڵە ☰ لکە

**لەکەدار** / lekedar/: ئاوەڵناو. ١. لەکەین؛ پـەڵاوی؛ بەپەڵە ٢. *[مەجاز]* ناوزڕاو؛ ئابڕووتکاو ☰ ١و٢. لکّەدار

**لەکەرەمبوو** / lekerembû/: ☜ لەکەرەمکەوتوو

**لەکەرەمکـــــــــــەفتگ** / lekeremkeftig/: ☜ لەکەرەمکەوتوو

**لەکەرەمکەوتـــوو** / lekeremkewtû/: ئاوەڵـــــناو. لەکەرەمبـوو؛ لەکـەرەمکـەفتگ؛ لەکارکەوتـە ☰ ازکارافتادە؛ غیر قابل استفادە

**لەکەین** / lekeyn/: ☜ لەکەدار ـ١

**لەکیس‌چـوو** / lekîsçû/: ئاوەڵـناو. لـــەقیس‌چـــوو؛ لـــەکیس‌چـــووگ: ١. لـــە دەســـت دەرچـــووی دەرفەت‌ڕەخساو ‹هـەلی لـەکیس‌چـوو› ٢. خـراو بـووگ؛ خەسـاربوو ‹میـوەی لـەکیس‌چـوو› ☰ ١. ازدست‌رفتە ٢. تلف‌شدە

**لەکیس‌چووگ** / lekîsçûg/: ☜ لەکیس‌چوو

**لەگام** / legam/: ئاوەڵناو. چەورە؛ زگ‌لـەوەڕێن ☰ سورچران

**لەگان** / legan/: نـاو. لەگەن؛ قـاپی گـەورەی مـل هەڵگەڕاوەی زۆرتر لە مس کە ☰ لگن

**لەگاو** / legaw/: نـاو. قومارێکـە بـە مـۆرەی نـەرد دەکرێ ☰ نوعی قُمار با مُهرەهای نرد

**لەگرسـە** / legirse/: نـاو. جەڵـــتەخوێن؛ خـــوێنی مەیبو ☰ لختە خون

**لەگرنە** / legirne/: ئاوەڵکار. ☜ لەگرە

**لـەگرە** / legre/: ئاوەڵـکار. لەگرنـە؛ لێـرە؛ لـە ئـەم جێگە ‹لەگرە دانیشە› ☰ در اینجا

**لەگرەودوا** / legrewd(i)wa/: ☜ لەمەودوا

**لەگرەولا** / legrewla/: ☜ لەمەودوا

**لـەگرەوە** / legrewe/: ئاوەڵـکار. لـە ئـەم شـوێنەوە ‹لەگرەوە تا ئێنە› ☰ از اینجا

**لـەگژ** / legij/: ئاوەڵــناو. ١. خـــەریک؛ پـــەرژاو ٢. چنگاوژ؛ ئاوقا؛ دەسەویەخە ☰ ١. مشغول ٢. گلاویز

**لەگلەگ** / legleg/: نـاو. لەکلەک؛ لکلـک؛ لەقلـەق؛ حـــاجی‌لەقلـــەق؛ حـــاجی‌لەگلـــەگ؛ تۆرەمـــە باڵندەیەکی گەورەی کۆچەرن، نێر و مێیان یەک ڕەنگن، لاق و مل و دندووکیان درێـژە، لـە سـەر دار، ڕەوەز و خانووبـــەرەی بڵـــیند هێلانـــە ســـاز دەکەن، زۆرتر بە ماسی، مار، بۆق، مێشە و مەگەز و کەلاکی گیانلەبەران دەژین، دوو جۆری ڕەش و سپییان هەیە. بە ڕەشەکانیان دەڵـێن حللێـر ☰ لک‌لک

**لەگوێن** / le g(i)wên/: ئـامراز. لە ڕەنگ؛ لـە جـۆر؛ وەک؛ وەکـوو ‹شـەپۆلی لـەگوێن خـوێنی شـەرمی کچانە/ لە سـەر ڕوومـەتی مـاتی بـووکی ڕەزاسـووک «سوارە»› ☰ همانند

**لـەگۆبـەر** / legober/: ئاوەڵـناو. تەزێنـــەر؛ تـــەزک؛ سڕکەر ☰ بی‌حس‌کنندە

**لەگۆچـــوو** / legoçû/: ئاوەڵـــناو. لـــــەگۆچووگ؛ لەگۆکەوتوو؛ تایبەتمەنـدی ئەنـدامی لـە جوولـە کەوتوو لە سـەرمادا ☰ ویژگـی انـدام بـی حـس و حرکت شدە بر اثر سرما

**لەگۆچووگ** / legoçûg/: ☜ لەگۆچوو

**لەگۆره / le gore/**: ئامراز. بەرانبەر؛ بە پێی ‹لەگۆرەی قسەی تۆ، دەبێ وا بێ› ☰ طبق؛ برابر با

**لەگۆکەوتو / legokewtû/**: ☜ لەگۆچو

**لەگە / lege/**: ئاوەڵناو. لنگ درێژ؛ تەژه ☰ لنگ‌دراز

**لەگەر / leger/**: ☜ لەگەڵ

**لەگەڕ / legeř/**: ئاوەڵناو. ڕەوان؛ وەگەڕ ☰ جاری؛ روان

**لەگەز / legez/**: ناو. لەغەز؛ مەتەڵ؛ لیچار ☰ چیستان؛ لُغز

**لەگەڵ / legeł/**: ئامراز. لەتەک؛ لەگەر؛ دەگەڵ: ١. پێرا؛ وێرا؛ وەل ‹ئەویش لەگەڵ خۆت بێنە!› ٢. تەک ‹لەگەڵ تۆمە ئالتوون بەسەر/ لە پەنجەرە سەر بێنە دەر! «فولکلۆر»› ☰ ١. همراه ٢. با

**لەگەڵی / legełî/**: ئامراز. تەک ☰ همراهِ؛ با

**لەگەڵیەکا / legełyeka/**: ئاوەڵکار. بەڤرا؛ پێکەوە؛ بەهەڤرا؛ وێرا ‹برا! با لەگەڵیەکا چاک بین› ☰ باهم

**لەگەن / legen/**: ☜ لەگان

**لەگینە / legîne/**: ئاوەڵکار. وێدەچێ؛ ڕەنگە ‹لەگینە ئەو بزنە هی ئێوە بێ› ☰ شاید؛ احتمالاً

**لەل[1] / lel/**: ناو. ١. کەمترین قسە ‹ئەگەر بێژی لەل، کافری و ڕەوایە خوێنت بڕێژن! «هەژار، چوار *نامیلکە*»› ٢. باڵدارێکی ڕاوکەرە بە قەد باشوو ٣. ☜ لەلە ـ١ ☰ ١. کمترین سخن ٢. پرندەای است شکاری ٣. ☜ لەلە ـ١

**لەل[2]**: ئاوەڵکار. لۆ؛ بۆچی؛ ئەڕا ☰ چرا؛ برای چه

**لەل[3]**: ئامراز. لەگەڵ؛ لەتەک ‹شێخە نووشتانێ لەل مەلەوانێ/ بووبوون بە هاوڕێ لە بیابانێ «قانع»› ☰ با؛ همراهِ

**لەلاو / lelaw/**: ☜ لاولاو

**لەلای / lelay/**: ئامراز. با؛ لە کن؛ ل جەم؛ ل نک؛ بە ‹بای شەماڵ لەلای لەیلێوە دەشنێ› ☰ نزدِ

**لەلوک / leluk/**: ☜ لەلۆ

**لەلوە / lelwe/**: ☜ لەلۆ

**لەلۆ / lelo/**: ناو. لەلوە؛ لەلۆک؛ لەلوو؛ لەیلووک؛ لەیلوک؛ دەرگووش؛ جۆلانەی زارۆ تێدا خەواندن ☰ ننو

**لەلو / lelû/**: ☜ لەلۆ

**لەلوک / lelûk/**: ☜ لوولە[1]

**لەلە / lele/**: ناو. ١. لەل؛ قووڵکراوە بە چەقۆ لە دار ٢. لیلە؛ تایەلەلە؛ پیاوێ کە لە ماڵاندا ئاگای لە منداڵان دەبوو ٣. شەقار؛ تلیشە؛ چاڵی باریک و درێژ لە ڕووپەڕی شتێکدا ٤. نێوانی ساقەتە و سەر، لە ئەندامی جینسی نێردا ☰ ١. شیار با کارد روی چوب؛ چوب‌خط ٢. لَله ٣. شیار ۴. میان حشفه و تن ذکر

◘ **لەلە کردن**: شوێن ـ شوێن کردنی دار بە تێخ ☰ چوب‌خط زدن؛ شیار کردن چوب با کارد

**لەلە گرتن**: خزمەتکار بە کرێ گرتن بۆ بەخێو کردنی زارۆکان ☰ لَله استخدام کردن

**لەلەکراو / lelek(i)raw/**: ئاوەڵناو. نقرنقر ☰ کنده‌کاری شده

**لەلەیی / leleyî/**: ناو. کاری خزمەتکاری زارۆکان ☰ لَلگی

**لەم[1] / lem/**: ناو. ١. ☜ لەمە ٢. بەڕەک؛ شفرەبەراز ٣. بڕکەی میوەی بێستان ٤. گوانی ئاژەڵ ٥. بتە؛ پنچک ٦. لەپ؛ ناو مشت ٧. مرک؛ کاری شان داهێنان و پاڵ دانەوە ☰ ١. ☜ لەمە ٢. دندان گُراز ٣. بوتەی پالیزی ۴. پستان حیوان شیردە ۵. بوتە ۶. کف دست ۷. لَم

**لەم[2]**: ئاوەڵناو. پڕ؛ تژە ☰ پُر

**لەم[3]**: ئامراز. */سوورکەڵە/* لە ئەم ☰ از این

**لەما / lema/**: ئامراز. بۆ ئەمە؛ لە بەر ئەمە ☰ برای اینکه

**لەمالەم / lemalem/**: ☜ لێوانلێو

**لەمان / leman/**: ئاوەڵناو. لە مردن دوور ‹دوکتور نەخۆشەکەمان لەمانە یان نامێنێ؟› ☰ دارای امید

زندگی

**لەماوەرد** / lemawerd/: ئاوەڵناو. زکماک؛ مادەرزاد ⇐ مادرزاد

**لەمبوز** / lembûz/: ☜ لمبۆز

**لەمپا** / lempa/: ☜ لامپا

**لەمپڕ** / lempiř/: ئاوەڵناو. ١. زگپڕ؛ ئاوس ٢. گەنمی کاتی قەف و گوڵ کە هێشتا گوڵەکەی دەرنەهاتووە ⇐ ١. آبستن ٢. شاخەی گندم هنوز خوشه نکرده

**لەمپە** / lempe/: ☜ لامپا

**لەمپەر** / lemper/: ناو. بەرگر؛ کۆسپ ⇐ مانع

⊡ **لەمپەر پەڕاندن**: بەرگر نەهێشتن؛ کۆسپ لە سەر ڕێگە لابردن ‹تیژباڵ دەفڕن نێوانی دەبڕن/ لەمپەر دەپەڕێنن و پەردە دەدڕن «هەژار، *مەم و زین*»› ⇐ رفع مانع کردن

**لەمپەرە** / lempere/: ئاوەڵناو. لارەوەبووی بە لایەکدا ⇐ به طرفی کج شده

**لەمپەڕ** / lempeř/: ئامراز. لە ئەم لاوە ‹لەمپەڕ تا ئەوپەڕی باخەکە داری گوێزە› ⇐ از این سوی

**لەمتکەوی** / lemitkewî/: ☜ لەمنت کەوێ

**لەمتکەوێ** / lemitkewê/: ☜ لەمنت کەوێ

**لەمتەز** / lemtez/: ئاوەڵناو. تەمەڵ؛ تەپلۆس ⇐ تنبل

**لەمس**[1] / lems/: ناو. کاری گلۆفین بۆ گەرم کردنەوەی ئەندام ⇐ عمل فشُردن برای گرم کردن عضو

**لەمس**[2]: ئاوەڵناو. لەسم؛ شەپلەلێداو ‹دەستم لەمسە› ⇐ فلج شده؛ لمس

**لەمساندن** / lemsandin/: چاوگ. گلۆفینی دەست لە سەرما؛ دەست دەبن هەنگڵ نان لە سەرمان ⇐ فشردن دست برای گرم شدن

**لەمل** / lemil/: ئامراز. ١. دە ئەستۆدا ‹تۆق لەمل› ٢. لە گەردن؛ لە سەر؛ لە پای؛ لە عۆدەی ‹تاوان لەملی خۆتانە› ⇐ ١. در گردن ٢. به عُهدەی

**لەملا** / lemla/: ☜ لەملاوە

**لەملانە** / lemlane/: ناو. مایچە؛ ماسولکە ⇐ عضُله

**لەملاوە** / lemlawe/: ئاوەڵکار. لەملا؛ لە ئەم ئالییە نزیکەوە ⇐ از این‌طرف

**لەملەوەڕن** / lemleweřin/: ئاوەڵناو. /*پلار*/ لەگام؛ چەورە؛ نەوسنی مالانگەڕ و خوێڕی ⇐ شکم‌پرست بیکاره

**لەملین** / lemlîn/: چاوگ. خۆ کروشمە کردن لە سەرمان ⇐ خود را مُچاله کردن از سرما

**لەمن** / lemin/: ئاوەڵناو. /*پلار*/ ١. لەموو؛ زگزل ٢. چلێس؛ زکن ⇐ ١. شکم‌گُنده ٢. شکمو

**لەمنتکەوێ** / lem(i)nitkewê/: دۆعا. لەمت کەوی؛ لەمت کەوێ؛ ئافەرین؛ باریکەڵلا ‹جارێکە و ئەمجار لە منتان کەوێ/ هەرگیز وەک ئێستاو بۆ هەڵناکەوێ «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ⇐ آفرین

**لەمنتنەکەوێ** / lem(i)nitnekewê/: دۆعا. وشەی سەرکۆنە کردن ‹ـ کاری ئاومان هەیە، لە کێ پرسین؟ ـ ئای لە منتان نەکەوێ! ئەی من چیم؟! «هەژار، *چێشتی مجێور*»› ⇐ کلمەی سرزنش

**لەمۆز** / lemoz/: ☜ لمبۆز

**لەموو** / lemû/: ☜ لەمن

**لەمووز** / lemûz/: ☜ لمبۆز

**لەمە** / leme/: ناو. لەم؛ زگ؛ زک؛ سک ⇐ شکم

**لەمەبەر** / lemeber/: ☜ لەمەوپێش

**لەمەبەولا** / lemebewla/: ☜ لەمەبەولاوە

**لەمەبەولاوە** / lemebewlawe/: ئاوەڵکار. لەمەبەولا؛ لەمەودوا؛ لەوەپاش؛ لەوەدوا؛ لە دواییدا؛ لە ئێستە بەولاوە ‹هیوادارم لەمەبەولاوە فریوی فێڵبازان نەخوین› ⇐ از این به بعد

**لەمەپتر** / lemepitir/: ئاوەڵکار. نەیووتەپیا؛ زیاتر لەمە ⇐ بیش از این

**لەمەپەڕی** / lemepeřî/: ناو. بارداری؛ زگپڕی ⇐ بارداری

**لەمەت** / lemet/: ناو. ١. دەیندار؛ هۆباڵ بە مل ٢. گلەیی لە بەخت ٣. پاشەملە؛ پشتەسەر ☰ ١. مدیون ٢. شکوه ٣. غیبت

**لەمەدوا** / lemed(i)wa/: ☜ **لەمەبەولاوە**

**لەمەڕ** / lemeř/: ئامراز. ١. دەربارەی؛ سەبارەت ‹لەمەڕ بێکارییەوە قسەی دەکرد› ٢. بۆ؛ لەبۆ ‹ئەو ڕۆژە دۆست لەمەڕ دۆست هیچ کارێکی لە دەس نایە «هەژار، *قورئان*»› ☰ دربارەی

**لەمەزەڕینە** / lemezeřîne/: ☜ **لەبزەڕینە**

**لەمەلەم** / lemelem/: ناو. کاری ڕاسپاردن بە تکاوە ☰ سفارش با خواهش

**لەمەوبەر** / lemewber/: ☜ **لەمەوپێش**

**لەمەوپاش** / lemewpaş/: ☜ **لەمەودوا**

**لەمەوپێش** / lemewpêş/: ئاوەڵکار. لەمەبەر؛ لەمەوبەر؛ لەوەبەر؛ لەوپێش؛ لەمەپێش؛ بەر ژنووکە؛ بەر لە ئێستا ☰ پیش از این

**لەمەو داین** / lemewdayn/: پاڵۆدان؛ شان داهێلان؛ هەلاژیان ☰ لم دادن

**لەمەودوا** / lemewd(i)wa/: ئاوەڵکار. لەگرەودوا؛ لەگرەولا؛ لەمەوپاش؛ لەمەولا؛ لەمەولاوە؛ لەمەبەولا ☰ زین پس

**لەمەولا** / lemewla/: ☜ **لەمەودوا**

**لەمەولاوە** / lemewlawe/: ☜ **لەمەودوا**

**لەمەیی** / lemeyî/: ناو. نەخۆشییەکی منالانە ☰ از بیماری‌های کودکان

**لەمیانە** / lemyane/: ئاوەڵکار. لە ئەم جێگە ☰ از اینجا

**لەمیچ** / lemîç/: ☜ **لەمیش**

**لەمیچە** / lemîçe/: ☜ **لەمیش**

**لەمیش** / lemîş/: ئامراز. لەمیچ؛ لەمیچە؛ لە ئەمەش ☰ از این هم

**لەمێ** / lemê/: ئاوەڵکار. لە ئەم جێگە ☰ در اینجا

**لەمێژ** / lemêj/: ئاوەڵکار. لە زۆر پێش ئێستا ‹لەمێژە نەمدیوە› ☰ از دیرباز

**لەمێژەوە** / lemêjewe/: ئاوەڵکار. ژمێژڤە؛ لە زوووە ☰ از قدیم

**لەمێژینە** / lemêjîne/: ئاوەڵناو. کەونارا ‹مێژووی لەمێژینەی گەلی کورد› ☰ باستانی

**لەن** / len/: ناو. دوورگەی پچووکی ناو چەم ☰ جزیره مانند ماسه‌ای در رودخانه

**لەناو** / lenaw/: ئامراز. دە نێودا؛ لە دوور ☰ در میانِ

**لەناوچوو(گ)** / lenawçû(g)/: ئاوەڵناو. لەنێوچوو؛ لە بەین براو؛ تەفروتووناکراو ☰ نابود شده

**لەنتەر** / lenter/: ناو. لەنتەری؛ فانووس ☰ فانوس

**لەنتەری** / lenterî/: ☜ **لەنتەر**

**لەنج**[1] / lenc/: ناو. لەج؛ ڕق؛ قین؛ جڕ؛ جەڕ؛ جەهر؛ جەحر؛ جیەڵ؛ جییەر؛ بوجەر؛ سینی؛ سین؛ ڕک؛ کوت؛ بەرهەڵستی و پێداگری نەگونجاو لە سەر شتێ ☰ لج

⊡ **لەنج کردن**: لەج/ ڕک کردن ☰ لج کردن

**لەنج**[2]: پێرۆ. ← **لارولەنج**

**لەنجباز** / lencbaz/: ئاوەڵناو. لەنجوو؛ لاسار ☰ لجباز

**لەنجوو** / lencû/: ☜ **لەنجباز**

**لەنجە** / lence/: ناو. کاری ڕۆیشتنی بە ناز ‹هەر لە دێوە هەتا ناو ڕان/ بە لەنجە دێن شیردۆشی جوان «گۆران»› ☰ خرام

**لەنجەولار** / lence w lar/: ناو. لارە؛ لەنجە؛ کاری ڕۆیشتنی بەناز ‹بە تاسکەتاسک و بە لەنجەولارت/ بە بەژن و بالای بەرز و لەبارت «هێمن»› ☰ خرام

**لەند**[1] / lend/: ناو. دوورگە؛ بەرزایی زەوی کە دەوری ئاو گرتوویە ☰ جزیره

**لەند**[2]: ئاوەڵناو. بەرز؛ بلند ☰ بُلند

**لەند**[3]: پێرۆ. ← **کەندولەند**

**لەندەهۆر** / lendehor/: ئاوەڵناو. [*پلار*] تەژەی زەبەلاح؛ زلی پێنەکەوتوو ☰ لندهور

**لەنف** / lenf/: ☜ **لیمف**

**لەنکاو** / len(i)kaw/: ئاوەڵکار. لەپڕ؛ کتوپڕ ≣ ناگهان

**لەنگ**[1] / leng/: ناو. وچان؛ ڕاوەستانێکی کەم بۆ پشوو دان ≣ توقف اندک برای آسودن

**لەنگ**[2]: ئاوەڵناو. ١. شەل؛ سەقەت ٢. خوار؛ لار ‹ئەم بارە لەنگە› ٣. لە کێش ترازاو (بۆ شیعر) ‹باڵێکی شیعرەکەت لەنگە› ٤. ڕاوەستاو بە هۆی کەم و کووڕی ‹کارمان لەنگە› ≣ ١. لنگ؛ شَل ٢. کج ٣. ناموزون ۴. لنگ (کار)

⊡ **لەنگ کردن**: بوونە هۆی وەستان و فەوتان.
هەروەها: **لەنگ بوون** ≣ لنگ کردن

**لەنگی شتێک بوون**: ڕاوەستانی کار لە بەر کەم و کووڕی ≣ لنگ چیزی بودن/ شدن

**لەنگان** / lengan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //ـــ ؛ دەلەنگێ؛ بلەنگێ// ١. لەنگین؛ شەلین ‹شەل نییە و ئەلەنگێ! «مەسەل»› ٢. بە کەم و کووڕی بوون ≣ ١. لنگیدن ٢. نقص داشتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەلەنگان

**لەنگاندن** / lengandin/: چاوگ. تێپەڕ. //لەنگاندت؛ دەلەنگێنی؛ بلەنگێنە// لەرزاندن؛ جووڵاندن ≣ لرزاندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەلەنگاندن

**لەنگر** / lengir/: ئاوەڵناو. شەل ≣ لنگ

**لەنگڕۆ** / leng(i)řo/: ناو. هەنگڵەشەلە؛ کاری لە سەر یەک پا ڕۆیشتن ≣ عمل لی‌لی رفتن

**لەنگوچ** / lenguç/: ☜ **لەنگوچك**

**لەنگوچک** / lenguçik/: ناو. لەنگوچ؛ ئەنگوچک؛ لەوەندی ≣ آستین بُلند

**لەنگولۆر** / leng û lor/: ئاوەڵناو. خوار و خێچ ≣ کج و معوج

**لەنگولەتەر** / leng û leter/: ناو. قاچ و قول؛ پا و پل؛ پا و پووز ≣ لنگ و پاچه

**لەنگۆرە** / lengore/: ئاوەڵکار. لەنگۆرێ؛ ئەنگۆرە؛ سەرەتا؛ دەسپێکی دەمێک ‹بەهاری خۆش سەر لەنگۆرە دیارە› ≣ اوایل موسم

**لەنگۆرێ** / lengorê/: ☜ **لەنگۆرە**

**لەنگە** / lenge/: ناو. ١. لەرە لە بەرزییەوە ‹ئەم کاریتە تۆزێ لەنگە دەکا› ٢. ڕاوێستانێ کەم ٣. لنگە؛ تا؛ لف ≣ ١. لرزش از بلندی ٢. وقفە؛ توقف کوتاه ٣. لنگه

⊡ **لەنگە کردن**: ١. شەلین؛ شەلیان ٢. لەرزینی کەم لە بەرزییەوە ≣ ١. لنگیدن ٢. لرزیدن اندک در بلندی

**لەنگەر**[1] / lenger/: ناو. ١. ئاسنی سەر بە قولاپی بە زنجیرەوە کە بۆ وێستانی گەمیە دەخرێتە دەریاوە ٢. چۆنیەتی خۆ گرتن و ڕاوێستان لە سەر شوێنی باریک و بەرز ‹چۆنە لەم سەر دیوارە باریکە لەنگەری گرتووە؟!› ٣. دۆخی لە فڕین ڕاوەستانی باڵندە لە حەوا ≣ ١. لنگر کشتی ٢. حفظ تعادل در بلندی ٣. حالت توقف پرنده حین پرواز

⊡ **لەنگەر بەستن**: */کنایە/* نیشتەجێ بوون؛ لە شوێنێ جێگیر بوون ‹وەرن زیارەتی غەوسەلئەعزەمێ بکەینەوە، ئەگەر لەنگەری بەستووە لە بەغدایە «پایزە»› ≣ اقامت گُزیدن

**لەنگەر خستن**: ١. ☜ **لەنگەر گرتن ـ١** ٢. */پلار/* دامەزران لە شوێنێ ≣ ١. ☜ **لەنگەر گرتن ـ١** ٢. ماندگار شدن در جایی

**لەنگەر فڕێ دان**: ☜ **لەنگەر گرتن ـ١**

**لەنگەر گرتن**: ١. لەنگەر هاویشتن/ هاویتن/ ئاویتن؛ لەنگەر خستن؛ لەنگەر فڕێدان؛ ڕاوەستانی گەمی لە قەراخ دەریا ‹کار سەری گرت، لە سەر جوودی لەنگەری گرت، گوترا تارن ئەوانەی ناحەقیکارن «هەژار، *قورئان*»› ٢. خۆ ڕاگرتن لە سەر بەرزایی ٣. بە توانا بوون لە هەڵگرتنی شتێکدا ٤. تۆزێ پشوو دان ٥. باڵ

لەراندن و ڕاوەستانی باڵـندە بـە حـەواوە ☰ ۱. لنگر انداختن ۲. حفظ کـردن تعـادل در بلنـدی ۳. توانا بودن در برداشتن چیزی ۴. کمـی ایسـتادن ۵. توقف پرنده در حال پرواز

**لەنگەر هاویشتن/ هاویتن/ ناویتن:** ☜ **لـەنگـەر گرتن ـ۱**

**لەنگەر**[۲]: ئاوەڵناو. لەکارکەوتە ☰ ازکارافتاده

**لەنگەرخانە** / lengerxane/: ناو. فەقیرخانە؛ ماڵـێ کە پیر و پاتاڵ و فەقیری لێ بـەخێو دەکـەن ☰ نواخانه

**لەنگەرگا** / lengerga/: نـاو. لەنگەرگـە؛ قـەراخی دەریا کە گەمیەی لێ ڕادەوەستن ☰ لنگرگاه

**لەنگەرگە** / lengerge/: ☜ **لەنگەرگا**

**لەنگەرە**[۱] / lengere/: نـاو. زەنبەلـەک؛ بەنـدۆڵ؛ لیزۆک؛ شندل؛ هەڵواسراوی بەهاتوچۆ ☰ پاندول

**لەنگەرە**[۲]: ئاوەڵـناو. شەلی بە هەردولادا شـەل ☰ از هر دو پا لنگ

**لەنگەری** / lengerî/: ناو. ۱. قـاپی گـەورە و پـەلی چێشت خواردن ۲. سینی: *ئا)* پچووک *ب)* گەورە ۳. هەر شتی خڕ و گرۆڤەر ٤. شەپکەی بە دەورە ☰ ۱. دیس ۲. سینی: *الف)* کوچک *ب)* بزرگ ۳. گِـرد ۴. شاپو

**لـەنگـەلـەنـگ** / lengeleng/: ئاوەڵـکار. شـەلانە؛ شەلەشەل ☰ لنگان

**لەنگی** / lengî/: ناو. شەلی؛ سەقەتی پا ☰ لنگی

**لـەنگین** / lengîn/: چـاوگ. تێپەڕ. //ـ دەلـەنگی؛ بلەنگە// ۱. شەلین ۲. لەرزین بە سەبر ۳. *[مەجاز]* گیر و گرفـت هـەبوون لـە کـاردا ‹ئـەم کـارە لـە شوێنێکەوە دەلەنگێ› ☰ ۱. لنگیدن ۲. لرزیدن اندک ۳. گیر داشتن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: لـەنگیو/ چـاوگی نـەرێنی: نەلەنگین

**لەنگێز** / lengêz/: ناو. لـەنگێزە؛ قـوڕ و چڵـپاو ☰ گل‌ولای

**لـەنگێزە** / lengêze/: ناو. ۱. ☜ **لـەنگێـز** ۲. بـا و باران پێکەوە ☰ ۱. ☜ **لەنگێز** ۲. باد و بارانِ توأم

**لەنەکاو** / lenekaw/: ئاوەڵکار. لـەهێک؛ لەهێکـڕا؛ لەپڕ ☰ ناگهان

**لـەنیا** / lenya/: نـاو. پرێشـکەی ئـاوی تاڤـگە ☰ قطرەی آبشار

**لەنێوچوو** / lenêwçû/: ☜ **لەناوچوو**

**لـەو**[۱] / lew/: ناو. ۱. ☜ **لێو** ۲. بزاو؛ جووڵـە ☰ ۱. ☜ **لێو** ۲. حرکت

**لەو**[۲]: ئامراز. ۱. لە ئەو؛ ژ وێ ۲. لەوا؛ بۆیە؛ لە بـەر ئەوە ☰ ۱. از او ۲. از این رو

**لەوا**[۱] / lewa/: ئاوەڵکار. ئاوا؛ بەم چەشنە ☰ این‌طور

**لەوا**[۲]: ئامراز. بۆیە؛ لە بەر ئەوە ☰ زیرا

**لەوار** / lewar/: پێرۆ. ← **لەق و لەوار**

**لەوازە** / lewaze/: نـاو. ۱. پازەناو؛ چێـوی ڕێـک و تـەراز کـردنی بـەرداش ۲. ☜ **لۆسـە ـ۱** ☰ ۱. چوب‌های تراز کردن سنگ آسیا ۲. ☜ **لۆسە ـ۱**

**لەواسە** / lewase/: ناو. ۱. بەری دەست ۲. بـەری پێ ☰ ۱. کف دست ۲. کف پا

**لەواش** / lewaş/: ناو. ۱. خرمچوون؛ چوار پـەل ۲. ☜ **لەواشە** ۳. لەواشـە؛ شکەڤـا؛ نانـاتیرە؛ نـانی تیری؛ نانێ تیریە؛ شاتە تیری؛ نانی ناسک و پـان و تـەنک کـە بـە تـیرۆک پـان دەکرێتـەوە و بـە تەندووردا دەدرێ ☰ ۱. چهـار دسـت و پـا ۲. ☜ **لەواشە** ۳. لواش

**لەواشە** / lewaşe/: ناو. لەواش: ۱. لۆشکە؛ لۆچکە؛ قەفانچەلـەی ناڵـبەند کـە لێـوی یەکـسـمی پـێ دەبەستن ۲. نانی تیری ☰ ۱. لباشن ۲. نان لواش

⊡ **لەواشە کردن:** تونـد قووجانـدن ‹گوێتـان بگـرن لەگەڵ چاوتـان!/ لـەوس و لچتـان لەواشـە کـەن! «گۆران»› ☰ مُحکم به هم آوردن

**لـەوان**[۱] / lewan/: چـاوگ. بـزووتن؛ جـووڵان ☰

حرکت کردن

**لەوان**[٢]: ناو. ١. بەرزایی؛ بڵندایی ٢. جەگەن؛ گیایەکی لاسک سێ سووچە لە زەلکاوان دەڕوێ ☰ ١. بلندا ٢. جگن

**لەوانەیە** / lewaneye/: ئاوەڵکار. وێدەچێ؛ ڕەنگە ‹ئەگەر قسە بکەی لەوانەیە دەرت بکا› ☰ شاید

**لەوپادایێش** / lewpadayîş/: چاوگ. ڕامووسان؛ ماچ کردن ☰ بوسیدن

**لەوپێش** / lewpêş/: ☜ لەمەوپێش

**لەوت** / lewt/: ئاوەڵناو. گەمار؛ قرێژ؛ پیس؛ چەپەڵ ☰ پلید

**لەوتان** / lewtan/: چاوگ. پیس بوون ☰ پلید شدن

**لەوتاندن** / lewtandin/: چاوگ. پیس کردن ☰ کثیف کردن

**لەوتش** / lewtiş/: چاوگ. مژینی گوانی دایک لە لایەن بێچووڕا ☰ مُک زدن بچه به پستان مادر

**لەوتک** / lewtik/: ناو. زاربێنی بێچووی ئاژەڵ کە دایکی نەمژێ ☰ پوزەبند نوزاد دام

**لەوتوت** / lewtût/: ئاوەڵناو. *[پلار]* ١. لێوئەستووری سوورەوەبوو ٢. لیچ داژەناو ☰ ١. دارای لب قرمز و کلفت ٢. لب فروهشته

**لەوتەنە** / lewtene/: چاوگ. بزووتن؛ جوولان ☰ جُنبیدن

**لەوتی** / lewtî/: ئاوەڵناو. پیس‌کراو؛ چەپەڵ بووگ ☰ آلوده

**لەوتلەوت** / lewtlewt/: ناو. ١. چەقەسرۆیی؛ چەڵتەچەڵت ٢. وەڕەی سەگ ☰ ١. وراجی ٢. پارس سگ

**لەوج**[١] / lewc/: ناو. *[پلار]* وڕ؛ قسەی بێ‌تام ☰ یاوە؛ زِر

**لەوج**[٢]: ئاوەڵناو. *[پلار]* گەوج؛ دەبەنگ؛ گێل ‹گەوج و لەوج› ☰ هالو

**لەوجڕ** / lewciř/: ئاوەڵناو. *[پلار]* چەنەبازی زۆروەڕ ☰ ژاژخا

**لەوجە** / lewce/: ناو. تانە؛ تەشەر؛ لۆمە ☰ طعنه

**لەوچ** / lewç/: ناو. *[پلار]* دەم و فلچ ☰ لوچه

**لەوچۆڕ** / lewçoř/: ئاوەڵناو. *[پلار]* لێوشۆڕ؛ ژێرلێو داچۆڕاو ☰ لب‌فروهشته

**لەوچە** / lewçe/: ناو. *[پلار]* قەوچە؛ کاری شەویلاک جوولاندن بە دەمی ئاوەڵاوە ☰ عمل فک زدن با دهان باز

**لەوچەلەوچ** / lewçelewç/: ناو. *[پلار]* قسەنەزانی و ناڕەوانی لە ئاخاوتندا ‹گوێ نادەم بە لەوچەلەوچی تۆ› ☰ مُهمل گویی

**لەوح** / lewĥ/: ناو. دەپ؛ تەختە ☰ لوح؛ تخته

**لەوحانە** / lewĥane/: ئاوەڵکار. لەو کاتەدا ☰ در آن دم

**لەودوا** / lewd(i)wa/: ئاوەڵکار. ١. پاش ئەو ٢. دوای ئەوە ☰ ١. پس از او ٢. سپس

**لەودە**[١] / lewde/: ☜ لۆدە ـ١

**لەودە**[٢]: ئاوەڵناو. ١. گەوج؛ لەوج ٢. حەنەکچی؛ گالتەباز؛ قسەخۆش ☰ ١. هالو ٢. لوده

**لەور** / lewir/: ☜ لاور

**لەورە** / lewre/: ☜ لەوێ

**لەوڕا** / lewřa/: ئاوەڵکار. چونکە؛ لە بەر ئەوە ☰ زیرا

**لەوزە** / lewze/: ناو. ئاڵوو؛ بادامەی بن گەردن ☰ لوزه

**لەوزینە** / lewzîne/: ☜ لەبزینە

**لەوس**[١] / lews/: ناو. *[پلار]* لەوچ؛ دەم و فلچ؛ لێوی ئەستووری داکەوتوو ☰ لوچه

**لەوس**[٢]: ئاوەڵناو. *[پلار]* تەپلۆس؛ لەش‌قورس ☰ تن‌لش

**لەوسا** / lewsa/: ☜ لەوساوە

**لەوساوە** / lewsawe/: ئاوەڵکار. لەوسا؛ لەو جارەوە

‹لەوساوە کە تۆ ڕۆیی، دڵم ڕۆیی بە دووتا/ هێلانەیی تەن هەر وەکوو مەئوایی سەقەر ما «حەریق»› ☰ از آن به بعد

**لەوس‌پان** / lewspan/: ☜ **لچ‌قەوی**

**لەوسن** / lewsin/: ناوەڵناو. [پلار] لچولێوشۆڕ ☰ لب و لوچه فروهشته

**لەوشەقاتا** / lewşeqata/: ناوەڵناو. حەفلەچ؛ لێوکەت ☰ لب‌شکری

**لەوڤەرادایە** / lewveradaye/: ناو. [پلار] لیچی داژەنیو ☰ لب فروهشته

**لەولا** / lewla/: ناوەلکار. لەولاوە؛ ل ڤێ ئالییەوە ☰ از آن‌طرف

**لەولاو** / lewlaw/: ☜ **لاولاو**

**لەولاوە**[1] / lewlawe/: ناو. ١. لاولاوەی دەرک و پەنجەرە ٢. ☜ **لاولاو** ☰ ١. لولای در و پنجره ٢. ☜ **لاولاو**

**لەولاوە**[2]: ☜ **لەولا**

**لەولقاندن** / lewl(i)qandin/: چاوگ. لە خاو دەرخستنی ئەسپ و لینگ‌دانی ☰ گرم کردن اسب

**لەولەو** / lewlew/: دەنگەناو. لوورەلوور ☰ زوزه

**لەوم** / lewm/: ☜ **لۆمە**

**لەوما** / lewma/: ئامراز. بۆیە؛ لە بەر ئەوە ☰ از این رو

**لەوماکو** / lewmakû/: ئامراز. ١. چونکی؛ چونکوو ٢. ئەگەرچی ☰ ١. زیرا ٢. اگرچه

**لەون** / lewn/: ناو. جۆر؛ تەرز ‹بە هیچ لەونێ ناخەوێ› ☰ نوع

⊡ **لەون لێ گۆڕان**: خەرەفان؛ حاڵ تێک‌چوون ☰ خِرِف شدن

**لەونایش** / lewnayîş/: چاوگ. ڕامووسان؛ ماچ کردن ☰ بوسیدن

**لەونج** / lewinc/: ناو. مێرگ؛ چیمەن ☰ چمن

**لەونلێ‌گۆڕاو** / lewnlêgořaw/: ئاوەڵناو. [پلار] خەرەفاو ☰ خِرِف شده

**لەوە**[1] / lewe/: ناو. ١. چڵپاو؛ قوڕاوی شل ٢. تەپلەسەر؛ تەوق سەر ☰ ١. لای و لجن ٢. تارک سر

**لەوە**[2]: ئامراز. لە ئەوە ☰ از آن

**لەوەبەر** / leweber/: ☜ **لەمەوپێش**

**لەوەپاش** / lewepaş/: ☜ **لەمەبەولاوە**

**لەوەپێش** / lewepêş/: ☜ **لەمەوپێش**

**لەوەتا** / leweta/: ☜ **لەوەتی**

**لەوەتی** / lewetî/: ئامراز. لەوەتا؛ لە سەردەمێکەوە؛ لە کاتێکەوە ‹بۆیە سووک و چرووکی ناو چەمەنی/ لەوەتی بووی هەمیشە پێدەکەنی «هێمن»› ☰ از آن زمان

**لەوەجە** / lewece/: ناوەڵناو. پێویست؛ پێداویست؛ لازم ☰ لازم

**لەوەدوا** / lewed(i)wa/: ☜ **لەمەبەولاوە**

**لەوەڕ** / leweř/: ناو. گیای خواردنی ئاژەڵ ‹لەوەڕم هەڵز و کەمایە و مەندێ/ لە سەران و لە گەدە و سامرەندێ «حەقیقی»› ☰ علف چرا

**لەوەڕا** / leweřa/: ناوەلکار. بەو بۆنەوە ☰ از آن رو

**لەوەڕان** / leweřan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //لەوەڕای؛ دەلەوەڕێی؛ بلەوەڕێ// لەوەڕین؛ لەوەڕیان: ١. چەرین؛ ئالف خواردنی ئاژەڵ ٢. [پلار] خواردن و زگ‌چەرێنی کردن ☰ ١. چریدن ٢. شکم‌چرانی کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: لەوەڕاو/ چاوگی نەرێنی: نەلەوەڕان

**لەوەڕاندن** / leweřandin/: چاوگ. تێپەڕ. //لەوەڕاندت؛ دەلەوەڕێنی؛ بلەوەڕێنە// لەوەڕانن؛ چەراندنی ئاژەڵ ☰ چرانیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: -/ چاوگی نەرێنی: نەلەوەڕاندن

**لەوەڕانن** / leweřanin/: ☜ **لەوەڕاندن**

**لەوەڕدان / leweřdan/:** ناو. مەرەک؛ تفاقدان؛ جێگەی کا و گزرە 🇮🇷 کاهدان

**لەوەڕگا / leweřga/:** ☜ لەوەڕگە

**لەوەڕگە / leweřge/:** ناو. لەوەڕگا؛ جێی لەوەڕ 🇮🇷 چراگاه

**لەوەڕیان / leweřyan/:** ☜ لەوەڕان

**لەوەڕین / leweřîn/:** ☜ لەوەڕان

**ـ لەوەڕێن / leweřên-/:** پاشەوشە. ئەوەی دەلەوەڕێنێ ‹گالەوەڕێن› 🇮🇷 ـ چران

**لەوەن / lewen/:** ناو. ١. قامیش ٢. ☜ لەڤەن 🇮🇷 ١. نی ٢. ☜ لەڤەن

**لەوەنتە / lewente/:** ناو. ١. گولاو ٢. عەتر 🇮🇷 ١. گُلاب ٢. عطر

**لەوەند / lewend/:** ☜ لەڤەند

**لەوەندە[1] / lewende/:** ناو. گیایەکی بۆنخۆشە 🇮🇷 گیاهی خوشبو

**لەوەندە[2]:** ☜ لەوهەندە

**لەوەندی / lewendî/:** ☜ لەڤەندی

**لەوهەندە / lewhende/:** ئامراز. لەوەندە؛ لە ئەم چەندە 🇮🇷 از این مقدار

**لەویا / lewya/:** ☜ لەوێ

**لەویانە[1] / lewyane/:** ☜ لەوێ

**لەویانە[2]:** ئامراز. لە ئەمەیان 🇮🇷 از این یکی

**لەوێ / lewê/:** ئاوەڵکار. لوێ؛ لەویا؛ لوێدەری؛ لوێرە؛ لەینە؛ لەورە؛ لوێنە؛ لەویا؛ لەویانە؛ لەوێندەر؛ لەوێندەرێ؛ لەوێنە؛ لە ئەینە؛ لەو جێگە ‹چم پێ دەڵێن لێر و لەوێ/ من کوردستانم خۆش دەوێ «هێمن»› 🇮🇷 در آنجا

**لەوێچ / lewêç/:** ناو. لاویچ؛ لاگوێل ‹چلێ پیاز و لەوێچێ نۆکەڕەشە/ دوو-سێ دانە هەڵووژەی کۆنی ساڵان «قانع»› 🇮🇷 پُر یک کفِ دست

**لەوێدا / lewêda/:** ئاوەڵکار. چاگە؛ دەوێدەرێ 🇮🇷 در آنجا

**لەوێدەرێ / lewêderê/:** ئاوەڵکار. هازا؛ لەوێ 🇮🇷 در اینجا

**لەوێر / lewêr/:** پێرۆ. ← لار و لەوێر

**لەوێڕا / lewêřa/:** ئاوەڵکار. لەو جێگە 🇮🇷 از آنجا

**ـ لەوێن / lewên-/:** پاشەوشە. ـ بزوێن؛ جووڵێنەر 🇮🇷 ـ جُنبان

**لەوێنا / lewêna/:** ئاوەڵکار. ژڤێڤە؛ لەوێڕا ‹لەوێنا داینە با لەبەر چاومەوە بێ› 🇮🇷 از آنجا

**لەوێندەر / lewênder/:** ☜ لەوێ

**لەوێندەرێ / lewênderê/:** ☜ لەوێ

**لەوێنە / lewêne/:** ☜ لەوێ

**لەوێنەنەبو / lewênenebû/:** ئاوەڵناو. بێوێنە؛ بێهاوتا 🇮🇷 بی‌نظیر

**لە وێنەی / le wêney/:** ئامراز. وەکی؛ لە تەرزی ‹لە وێنەی تۆ نییە لەم سەرزەمینە› 🇮🇷 همانندِ

**لەوێوە / lewêwe/:** ئاوەڵکار. ژا؛ هۆدە؛ لەوێ ‹باشە ئەرێ لەوێوە بۆ کوێ دەڕۆی؟› 🇮🇷 آنجا

**لەه / leh/:** ناو. پاژ؛ لەت؛ پارچە 🇮🇷 قطعه؛ تکه

**لەها / leha/:** ناو. پێلاو؛ پالا؛ کەوش 🇮🇷 کفش

**لەهان / lehan/:** ☜ لاکانی

**لەهاندن / lehandin/:** چاوگ. داگیر کردن؛ زەوت کردن 🇮🇷 تصرف کردن

**لەهانە / lehane/:** ناو. لەهەن؛ کەلەم؛ کەلەرم 🇮🇷 کلم

**لەهلاک / lehlak/:** ناو. مارمێلکە 🇮🇷 مارمولک

**لەهن / leh(i)n/:** ناو. کونی دڕندە و کەروێشک 🇮🇷 کُنام

**لەهندک / lehindik/:** ☜ لانکە

**لەهۆوێ / lehowê/:** ئاوەڵکار. لەوێ ‹لەهۆوێ کەوتووە› 🇮🇷 در آنجا

**لەهەز / lehez/:** ناو. مۆخڵ؛ هێڵەگ 🇮🇷 الک

**لەهەک / lehek/:** ناو. گۆڕیچە؛ ئەلحەد 🇮🇷 لحد

**لەهەن / lehen/:** ☜ لەهانە

**لەهی** / lehî/: ☜ **لافاو**

**لەهیزتن** / lehîztin/: ☜ **لەیستن**

**لەهیستن** / lehîstin/: ☜ **لەیستن**

**لەهیستۆک** / lehîstok/: ☜ **لەیستۆك**

**لەهێرت** / lehêrt/: ئاوەڵناو. بە قەوەت؛ بە تاقەت ☲ قوی

**لەهێک** / lehêk/: ئاوەڵکار. لەهێکرا؛ لەپڕ؛ لەنەکاو ☲ ناگهان

**لەهێکرا** / lêkřa/: ☜ **لەهێك**

**لەی** / ley/: ناو. ١. بەرە؛ پەلاس ٢. ☜ **لافاو** ٣. ئەستوون؛ کۆڵەکە ٤. داری ئاوکێشانی دووکەسە کە لە سەتڵی دەخەن ☲ ١. گلیم ٢. ☜ **لافاو** ٣. ستون؛ پایە ۴. تختەی حمل دو نفرەی آب

**لەیر** / leyr/: ناو. لەییر: ١. زارۆی ساوا ٢. جووچکەمەلی تازە لە هێلکە دەرهاتوو ٣. شینکەی تازە سەردەرهاوردوو ☲ ١. نوزاد ٢. جوجەی تازە از تخم درآمدە ٣. گیاە تازە سر برآوردە

**لەیرک** / leyrik/: ☜ **لەیرەك**

**لەیرۆ** / leyro/: ناو. منداڵی نێر؛ کوڕ ☲ پسربچە

**لەیرۆلوری** / leyrolurî/: ناو. کوڕیژگەی ئازا و نەترس ☲ پسربچەی شُجاع

**لەیرە** / leyre/: ئاوەڵکار. لێرە؛ لەم جێگەدا ‹لەیرە مەمنێژن ڕێخەڵانییە/ بموەن ئەولاتر حەوز و کانییە «فولکلۆر»› ☲ اینجا

**لەیرەک** / leyrek/: ناو. لەیرک: ١. بێچووی ئاژەڵ ٢. منالی ساوا ☲ ١. نوزاد دام ٢. طفل نوزاد

**لەیرەو** / leyrew/: ئاوەڵکار. ناتا؛ نات ☲ از این طرف

**لەیرێ** / leyrê/: ناو. منالی مێوینە؛ کۆرپەساوای کیژ ☲ دختربچە

**لەیز** / leyz/: ☜ **لەیس**

**لەیزاندن** / leyzandin/: چاوگ. هەڵپەڕاندن؛ سەما پێ کردن ☲ رقصاندن

**لەیزتن** / leyiztin/: ☜ **لەیستن**

**لەیزتۆک** / leyiztok/: ☜ **لەیستۆك**

**لەیزۆک** / leyzok/: ☜ **لەیستۆك**

**لەیزین** / leyzîn/: ☜ **لەیستن**

**لەیس** / leys/: ناو. لەیز: ١. سەما؛ ڕەقس ٢. گەمە و گاڵتە ٣. نۆبەی کایە لە گەمەدا ☲ ١. رقص ٢. بازی و سرگرمی ٣. نوبت بازی

**لەیستن** / leyistin/: چاوگ. لەهیستن؛ لەهیزتن؛ لەیزتن؛ لەیزین؛ لیزتن؛ لیزین؛ لیستن: ١. هەڵپەڕکێ کردن ٢. گەمە کردن ☲ ١. رقصیدن ٢. بازی کردن

**لەیستۆک**[1] / leys(i)tok/: ناو. لەهیستۆک؛ لەیزتۆک؛ لەیزۆک؛ لیزۆک؛ لیستۆک؛ لێزۆک: ١. ئامرازی گەمە ٢. بووکەڵەی منال ☲ ١. اسباببازی ٢. عروسک

**لەیستۆک**[2]: ئاوەڵناو. لەهیستۆک؛ لەیزتۆک؛ لەیزۆک؛ لیزۆک؛ لیستۆک؛ لێزۆک: ١. خولیای یاری کردن ٢. سەماکەری باش ☲ ١. معتادِ بازی کردن ٢. رقصندە

**لەیشۆ** / leyşo/: ناو. قوڕاو؛ هەڕگاو ☲ آب گلآلود

**لەیل** / leyl/: ناو. گراوی؛ ماشقە؛ دڵبەر ☲ معشوق

**لەیلاج** / leylac/: ناو. خولەقومارباز؛ قوماربازی زۆر لێزان ☲ لیلاج؛ قمارباز ماهر

**لەیلاخ** / leylax/: ناو. لەیلاغ؛ کوێستان؛ زۆزان؛ هاوینەهەوار ☲ ییلاق

**لەیلاغ** / leylağ/: ☜ **لەیلاخ**

**لەیلاق** / leylaq/: ناو. دەوەنێکە ☲ درختچەای است

**لەیلان** / leylan/: ناو. ١. بیابان؛ بیاوان؛ چۆل و دەشت؛ سارای بەرپان ٢. تراویلکە؛ بەردەڕێژگە ٣. بریقە؛ بریسکە ☲ ١. هامون ٢. سراب ٣. درخشش

**لەیلانک** / leylanik/: ناو. زەمبەق؛ گوڵی زەمەق ☲ زنبق

**لەیلانۆک** / leylanok/: ناو. گوڵێکی ڕەنگ

پەمبەیی تۆخە ☰ گلی به رنگ صورتی تیره

**لەیلوک** / leyluk/: ☜ **لەلۆ**

**لەیلومەجروم** / leylumecrum/: ناو. *[ئەستێرەناسی]* دوو ئەستێرەن سالێ جارێک بەرانبەر بە یەک دەبنەوە ☰ دو ستاره در مجموعەی جوزا

**لەیلوپەڕ** / leylûpeř/: ☜ **لیلوپەڕ**

**لەیلوک** / leylûk/: ☜ **لەلۆ**

**لەیلەدۆنێ** / leyledonê/: ☜ **لەککاتە**

**لەیم** / leym/: ناو. چڵک؛ گەماری؛ قڕێژ؛ چەپەڵی ☰ چرک؛ کثافت

**لەیمن** / leymin/: ناوەڵناو. لێمن؛ چلکن؛ چەپەڵ؛ گەمار؛ پیس و پۆخڵ ☰ چرکین

**لەیمنەت** / leyminet/: ناوەڵناو. چلکنی پووتەکە و پیسەکە ☰ زشت و چرکین

**لەیمولێشە** / leym û lêşe/: ناوەڵناو. لەیمولێشەک؛ لێشک؛ لێشەک: ١. گەمار؛ چلکن ٢. ژەنگاوی ☰ ١. کثیف ٢. زنگ‌زده

**لەیمولێشەک** / leym û lêşek/: ☜ **لەیمولێشە**

**لەینە** / leyne/: ناوەڵکار. ١. ☜ **لەوێ** ٢. ☜ **لێرە**

**لەیەڵ** / leyl/: ئامراز. لێڵ؛ لەگەڵ؛ دەگەڵ؛ لەتەک ☰ با (حرف اضافه)

**لەیی** / leyî/: ☜ **لافاو**

**لەییر** / leyîr/: ☜ **لەیر**

**لەییشۆ**[1] / leyîşo/: ناو. قوڕاو؛ هەڕگاو؛ ئاوی قوڕاوی ☰ آب گل‌آلود

**لەییشۆ**[2]: ناوەڵکار. بەپەلە؛ بلەز ☰ باشتاب

**لەیێکە** / leyêke/: ناو. ڕۆژەجووتێک لە زەوی ☰ زمین به اندازەی یک روز شخم زدن

**لهازە** / l(i)haze/: ☜ **لۆسە ـ١**

**لهرە** / lihre/: ناوەڵکار. لێرە؛ لەم شوێنە ☰ اینجا

**لهەڤ**[1] / lihev/: ناوەڵناو. ڕێکوپێک و لەبار ☰ شیک

**لهەڤ ـ**[2]: پێشگر. لێک؛ لە یەک ☰ با هم

⊡ **لهەڤپێچین**: لێک هالان؛ ئالۆزان؛ شێویان ☰ قاطی و درهم شدن

**لهەڤتەواندن**: داهێنانەوە؛ نەوی کردن ☰ خم کردن

**لهەڤخستن**: لێک دان؛ لە یەکتری دان ☰ کتک‌کاری کردن

**لهەڤکرن**: ئاشت بوونەوە؛ پێک‌هاتن ☰ صلح کردن

**لهەڤکەتن**: ١. دەمەقاڵە کردن ‹بەرێ نافبەرا وان باش بوو، ئەڤرۆ وەر لهەڤ کەتن› ٢. بە گژ یەکترا چوون ٣. وێک‌کەوتن ☰ ١. جدل کردن ٢. مُشاجره کردن ٣. برخوردن

**لهەڤگزرین**: ١. شەڕەدندووکە کردن ٢. خۆ لە یەکتر بە زل زانین ٣. لێکتر ڕاسان ☰ ١. جدل کردن ٢. خود را برتر دانستن ٣. به دعوا برخاستن

**لهەڤهاتن**: سازان؛ پێک هاتن ☰ با هم ساختن

**لهێڤ** / l(i)hêv/: ناوەڵناو. چاوەڕوان؛ چاونۆڕ؛ چاونهێر ☰ چشم‌به‌راه

**لهێڤی** / lihêvî/: ناوەڵناو. ١. بەئاوات؛ ئاواتەخواز ٢. چاوەنۆڕ؛ چاوەڕوان ☰ ١. آرزومند ٢. چشم‌به‌راه

**لهێم** / lihêm/: ☜ **لەحیم**

**لی** / lî/: ناو. ١. ☜ **لافاو** ٢. ناوێکی بازرگانی بۆ جل و پۆشەنی جین ☰ ١. ☜ **لافاو** ٢. لی

**لیا** / l(i)ya/: دەنگ. هۆی؛ هێی؛ هەرای بانگ کردن ☰ حرف ندا

**لیاقەت** / l(i)yaqet/: ناو. شیاوی؛ لێهاتوویی ☰ لیاقت

**لیان**[1] / l(i)yan/: چاوگ. ڕاژان؛ جووڵانەوە ☰ جُنبیدن

**لیان**[2]: ☜ **لاکانی**

**لیانی** / l(i)yanî/: ☜ **لونە**

**لیاو** / l(i)yaw/: ناو. لینجاو؛ لوعاب ☰ لعاب

**لیباس** / lîbas/: ناو. لباس؛ پۆشەنی؛ پۆشاک ☰

لباس

**لیبراڵ / lîbirał/**: ئاوەڵناو. ئـازادیخواز؛ هـۆگر و لاگری لیبرالیسم ☰ لیبرال

**لیبراڵیسم / lîbirałîsm/**: نـاو. ئـازادیخوازی؛ ئامۆژەی سیاسی و ئابووری کە لە سەر ئازادی و سەربەخۆیی ئابووری، کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی تاکەکانی کۆمەڵ دەڕوا و بەر بە دەسەڵاتی بێسنووری دەوڵەت دەگرێ ☰ لیبرالیسم

**لیپ[1] / lîp/**: ناو. ١. فێڵ؛ گزی ٢. پارووی زل ٣. پێڵ؛ شەپۆل ☰ ١. حیله ٢. لُقمەی بزرگ ٣. موج

**لیپ[2]**: ئاوەڵناو. لرپ؛ تژە؛ پڕ ‹کلـپەی نـوێ ئەخاتـە کوورەی عەشقی پاک/ دەفری گیان لیـپ ئـەکا لـە خۆزگەی بەر بوون «گۆران»› ☰ پُر

**لیپان / lîpan/**: ☜ **لێوانلێو**

**لیپانلیپ / lîpanlîp/**: ☜ **لێوانلێو**

**لیپاو / lîpaw/**: ناو. شەپۆلی چەم ☰ خیزاب

**لیپاولیپ / lîpawlîp/**: ☜ **لێوانلێو**

**لیپە / lîpe/**: ئاوەڵناو. ١. ☜ **لێوانلێو** ٢. *(پلار)* زۆر قەڵەو ☰ ١. ☜ **لێوانلێو** ٢. بسیار چاق

**لیت / lît/**: ناو. ١. ئاغەڵ؛ گەوڕ ٢. فێڵ؛ گـزی ٣. لووت؛ کەپۆ ☰ ١. آغُل ٢. حیله ٣. بینی

**لیتاو / lîtaw/**: ناو. چلپاو؛ قوڕاوی شـل ☰ لای و لجن

**لیتر / lîtr/**: نـاو. یەکـەی دێـران لـە دەزگـای میتریدا بەتایبەت بۆ پێـوانی تـراو، بەرامبـەر بـە ١٠٠٠ میلیمیتری چوارپاڵوو ☰ لیتر

**لیتک / lîtik/**: ناو. کاری بـاز بـردن؛ بـاز دانی بـە تەوژم ☰ پرش؛ جهش

**لیتور / lîtur/**: نـاو. ١. لیتەی ناو جۆگە ٢. بلـخی لینجی سەر بەردی نـاو چـەم ☰ ١. لای و لجـن جوی ٢. رسوب لزج روی سنگ‌های رودخانه

**لیتۆکە / lîtoke/**: ئاوەڵناو. پیس و پۆخڵ؛ چلکن و دزێوین ☰ زشت و کثیف

**لیتۆگرافی / lîtog(i)rafî/**: نـاو. ١. کـار و ڕەوتی سازکردنی پەڕەی هەستۆکی کانزایی بـۆ چـاپ ٢. کارگەی لیتۆگرافی ☰ ١و٢. لیتوگرافی

**لیتە / lîte/**: ناو. ١. مێوژی کوتراو بۆ شەربەت ٢. تلتە؛ خلت ٣. چلپاو؛ هەڕگاو ٤. جۆرێک ترشی لە باینجانەڕەشەی ئـەنجنراوی دەنێـو سـرکەدا کوڵاو ☰ ١. مویز کوبیده ٢. تفالـه ٣. لجـن؛ لای ٤. لیته

**لیتەک / lîtek/**: ئاوەڵناو. بێچارە و فەقیر ☰ بینوا

**لیتیوم / lîtyum/**: ناو. سۆکترین توخمی کانزا، بە ژمارەی ئەتومی ٣ و کێشی ئـەتومی ٦،٩٤، کـە نەرم و بۆرە و لە چێ کردنی ئالیاژی زوو تاودا بە کەڵک دێت ☰ لیتیم

**لیجە / lîce/**: نـاو. چلـپاو؛ لیتـە؛ لیتـاو ☰ لای و لجن

**لیجین / lîcîn/**: چاوگ. جووڵاندن (کلک و ...) ☰ تکان دادن (دُم و ...)

**لیچ[1] / lîç/**: نـاو. ١. لێـو؛ لـو؛ لـەو ٢. گـوڵاو ٣. قەراغ؛ کەنار ٤. مێـوژی کـوتراو ٥. ئەسـتێرک؛ گۆلاو ☰ ١. لوچه؛ لـب ٢. گُـلاب ٣. کنـار ٤. مـویز کوبیده ٥. استخر

**لیچ[2]**: ☜ **لینج**

**لیچار / lîçar/**: ناو. لەگـەز؛ دەناچیـە؛ مەتـەڵ ☰ چیستان

**لیچاڵ / lîçał/**: ناو. ١. سپیات؛ هەرچی لـە شـیر پەیدا دەبێ ٢. ڕێچار؛ مرەبا ☰ ١. لبنیات ٢. مُربا

**لیچق / lîçiq/**: ☜ **لینج**

**لیچقاو / lîçqaw/**: ☜ **لینجاو**

**لیچقایی / lîç(i)qayî/**: ☜ **لینجی ـ١**

**لیچقی / lîç(i)qî/**: ☜ **لینجی ـ١**

**لیخن / lîxin/**: ئاوەڵناو. لیخنـاو؛ لـێڵ؛ شـلوێ ‹بەڵـێ، دیـارە، لـە نـاو قـەومی بەسـیتا قـەدری سـنعەتکار/ وەکـوو عەکسـی قەمـەر وایـە لـە نـاو

# م

**م** / m/: پت. نیشانەی پیتی بیست و شەشەمی ئەلفوبێی زمانی کوردی ⇐ م؛ نشانەی بیست‌وششمین حرف الفبای کُردی

**م**[1] / mi/: ناو. ١. بیست‌وشەشەمین پیتی ئەلفوبێی زمانی کوردی ٢. کورتکراوەی مانگی لە «کۆچی ـ مانگی»دا ⇐ ١. م؛ بیست‌وششمین حرف الفبای کُردی ٢. مخفف قمری

**مـ**[2]: پێشگر. چێکەری وشەدوانەی بێ واتا، بە چوونە جێی پیتی یەکەمی وشەکە، کاتێ دووپات دەبێتەوە ‹کراس و مراس› ⇐ حرف مهمل‌ساز

**م**[1] / im/: جێناو. ١. لکاوی فاعیلی، یەکەم کەسی تاک ‹نەمخوارد؛ کردم› ٢. لکاوی خاوەنداریەتی، یەکەم کەسی تاک ‹کارم؛ ناوم› ٣. لکاوی بەرکاری یەکەم کەسی تاک ‹ناردمیان؛ بردمی› ٤. من؛ ئەز؛ یەکەم کەسی تاک بە جیایی ‹م گۆتە تە؛ ژ م ڕا› ⇐ ١. م؛ ضمیر متصل اول شخص مُفرد ٢. ضمیر متصل ملکی اول شخص مفرد ٣. ضمیر متصل مفعولی اول شخص مفرد ۴. من

**ـ م**[2]: پاشگر. ـەم؛ نیشانەی ناوەڵناوی تەرتیبی ‹چارم؛ حەوتم› ⇐ ـم؛ نشانەی ترتیب

**ما**[1] / ma/: ناو. ١. زەرد؛ شاخی لووس ‹پێش ئەوەی قاسپەی خاسەکەو لە زەرد و ما دەنگ داتەوە/ پێش ئەوەی بلبل بخوێنێ خونچە دەمی بکاتەوە «هێمن»› ٢. شکێڕ؛ قەڵشەبەردی زل ٣. ڕەوتی خۆ گرتن و نزیک بە پێگەیشتن ‹دۆکلیوەکە مای هاتۆتەوە› ٤. سەبەب؛ هۆ ٥. مانگ؛ هەیڤ ‹ماتاب› ⇐ ١. صخره‌ی بلند ٢. شکاف بزرگ در کوه ٣. قوام ۴. سبب؛ علت ۵. ماه

◘ **ما هاتنەوە**: ☜ **ما هێنان**

**ما هاوردنەوە**: لێک‌هاڵاندن و هێندێک گرساندنی تراو (بە کولاندن یان لێکدان) ⇐ قوام آوردن

**ما هێنان**: ما هاتنەوە؛ لێک‌هاڵان و هێندێک گرسانی تراو ‹دۆکلیوەکە مای هێناوە› ⇐ قوام آمدن

**ما**[2]: ناوەڵناو. مێ؛ مێوینە؛ مێنگە ‹نێر و ما› ⇐ مادە، مُقابل نر

**ما**[3]: ناوەڵکار. ١. ڕەنگە؛ ڕەنگ هەیە ‹ما ڕۆژەکی چێ بە› ٢. ئاخۆ؛ مەگەر ‹ما تە وە نەکرد؟› ٣. تۆ بێژی؛ تۆ بڵێی ‹ما وە دبێن› ٤. بۆچی؛ لە بەر چی؟ ‹ما وەیە؟؛ ما ئەز بچم؟› ٥. پرسی بە سەیر مانەوە ‹ما وە دکا؟› ⇐ ١. شاید ٢. مگر ٣. گویی ۴. چرا ۵. پُرسش با تعجب

**مائۆئیسم** / ma'o'îsm/: ناو. ڕێبازی سیاسی مائۆ تسەتونگ (١٨٩٣ـ ١٩٧٦ ز.)، ڕێبەری کۆمۆنیستی چین بە گوێرەی بۆچوونی مارکسیسم ـ لینینیسم (وەک: شۆڕشی وەرزێری، شەڕی چەکداری و جەهانی سێ‌جەمسەری) ⇐ مائوئیسم

**مابەک / mabek/**: ناو. ئالگ؛ لوو ☰ غُدە

**مابەی / mabey/**: ☜ **مابەین**

**مابەین[1] / mabeyn/**: ناو. مابەی؛ مابین؛ مابێن؛ ماحبەین؛ ماعبەین؛ ماعبێن: ١. دور؛ نێوان ‹لەفزی کوردی بلاو نەبوو گرد بوو/ وا لە مابەینی ئێمەدا تێچوو «حاجی قادر»› ٢. ئاشنایەتی ‹مابەینمان خۆشە› ☰ ١. میان ٢. میانە

**مابەین[2]**: ئامراز. مابەی؛ مابین؛ مابێن؛ ماحبەین؛ ماعبەین؛ ماعبێن؛ نێوان؛ نێوانی ‹چراخم کامەن، چراخم کامەن/ مابەین دۆستی من و تۆ کامەن «بێسارانی»› ☰ میانِ؛ میانەی

**مابین / mabîn/**: ☜ **مابەین[1]**

**مابێن / mabên/**: ☜ **مابەین[1]**

**ماپوک / mapûk/**: ناو. چەپۆک؛ کاری بە لەپ لە سەر دان ☰ توسری

**ماپەرە / mapere/**: ناو. باوێشک؛ باوشک ☰ خمیازە

**مات[1] / mat/**: ناو. ١. دۆخی کش بوونی شای شەترەنج بە جۆرێ کە ڕێی دەرباز بوونی نەبێ ٢. کەلابەردی زلتر لە کەلای ئاسایی ٣. چاڵ؛ قوولکەی پچووک بۆ کەلابازی ٤. مانگ؛ هەیڤ؛ هەوی ☰ ١. مات (شطرنج) ٢. تیلەی بزرگ ٣. چالەی کوچک تیلەبازی ٤. ماه

⊡ **مات بوون**: دۆڕاندن لە شەترەنجدا ☰ مات شدن (شطرنج)

**مات کردن**: بردنەوەی شەترەنج ☰ مات کردن (شطرنج)

**مات[2]**: ئاوەڵناو. ١. کز؛ کروشمەکردوو ‹ڕوخیشی کردە ئەو لا، دەیشیپرسی/ بە شۆخی، شاهی من! تۆ بۆچی ماتی؟ «مەحوی»› ٢. خەمگین؛ خەفەتبار ‹ئەگەر ماتی بۆچە هاتی؟ «مەسەل»› ٣. کولەکردوو؛ دەرفەتخواز لە کارێ ٤. سەرسووڕماو؛ واقوڕماو؛ مەنگ ‹خۆش لە سەر سینەی سەری هەڵداوە دوو گۆی سەربەمۆر/ مات و حەیرانم کە عەرعەر کەی هەناری گرتووە؟! «نالی»› ٥. تار؛ بە چەشنێ کە تەنیا بەشێک لە تیشک لێوەی تێپەڕ بێ و بریقەی نەیە ‹ڕەنگی مات› ٦. نەوی‌تر لە ڕیزی خۆی ‹ئەو بەردانەی دە ڕێگەت گرتووە یەکیان ماتە› ٧. مەنگ؛ مەند؛ خامۆش؛ کپ؛ بێدەنگ ‹هەی لایەلایە، ڕۆڵە لای لایە/ مات بە پێت بڵێم لە بەرچی وایە «هەژار، *ئاڵەکۆک*»› ☰ ١. کزکردە ٢. غمگین ٣. مُنتظر فرصت ۴. مُتحیر ۵. مات ۶. کم‌ارتفاع‌تر در یک ردیف ۷. ساکت و بی‌حرکت

⊡ **مات بردنەوە**: واق وڕمان ‹بۆ ماتت بردۆتەوە؟ تا ئێستا شتی وات نەدیوە؟› ☰ حیران شدن

**مات بوون**: ١. کز کردن ٢. سەر سووڕ مان؛ واق وڕمان؛ سەرگەردان بوون ٣. بێدەنگ بوون ٤. جێگر بوون ٥. ڕاوەستان؛ لە جووڵە کەوتن (شەڕ و ئاڵۆزی) ‹ماوەیەک شەڕ و هەرا مات بوو. منیان ناردە [گوندی] سەرای لای سەقز کە مابەین بم و ئاگادار بم عەشایر ئاڵۆزی نەنێنەوە «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ ١. کز کردن ٢. حیران شدن ٣. خاموش شدن ۴. جایگیر شدن ۵. متوقف شدن (جنگ و دعوا)

**مات کردن**: ١. بێدەنگ کردن ٢. زەقایی نەوی کردنەوە ٣. *[کینایە]* سارد کردنەوە؛ کوشتن ☰ ١. ساکت کردن ٢. برجستگی را صاف کردن ٣. کشتن

**خۆ مات دان**: کوڵە گرتن ☰ کمین کردن

**ماتاب / matab/**: ☜ **مانگەشەو[1]**

**ماتابان / mataban/**: ناو. مانگی لە عاسمان دیار ☰ ماە تابان

**ماتاڤ / matav/**: ناو. مەنداو؛ ئاوی مەند و لەسەرخۆ ڕۆ ☰ آب آرام

**ماتان / matan/**: ☜ **کەلایێن**

**ماتاو / mataw/**: ناو. ١. ☜ **مانگەشەو[1]** ٢. فیشەکەشێتە ☰ ١. ☜ **مانگەشەو[1]** ٢. فشفشە

**ماتریالیست** / matiryalîst/: ئاوەڵناو. هـۆگر و شوێنکەوتووی ماتریالیسم ☰ ماتریالیست

**ماتریالیسم** / matiryalîsm/: نـاو. ڕێبـازێکی فەلسەفی کـە مـاک بـە ڕاسـتییەکی ئەزەلـی و بنـەڕەتی دادەنـێ و هـەموو هـەبوو، ڕووداو و دیاردەکانی جیهـان و ژیـان بـە بەرهـەمی ئـەوە دەزانێ ☰ ماتریالیسم

**ماتریس** / matrîs/: ناو. ١. چوارچێوە؛ قاڵب؛ قالک ٢. *[ریازی]* ڕازەیـەک چوارگـۆش لـە ژمـارە یـان دەستەواژەی بیرکاری بـە شـێوەی چـەن دێـڕ و ئەستوون ☰ ١و٢. ماتریس

**ماتک** / matik/: نـاو. ١. ☜ **مـەتـی** ٢. بێشـکە؛ لانک؛ دێـدک؛ دەرگـووش ☰ ١. ☜ **مـەتـی** ٢. گهواره

**ماتکە** / matke/: ناو. ماتکێ؛ کرووشمە ☰ کِز

⊡ **ماتکە دان:** مـاتکێی خـۆ دان: ١. کـز کـردن؛ کزکۆڵە کردن ٢. ماتە دان؛ خۆ داگـرتن ☰ ١. کِز کردن ٢. کمین کردن

**ماتکێ** / matkê/: ☜ **ماتکە**

⊡ **ماتکێی خۆ دان:** ☜ **ماتکە دان**

**ماتگ** / matig/: ناو. میمک؛ مەت؛ مەتە ☰ عمّه

**ماتگە** / matge/: نـاو. وەچ؛ لقـی ناسـکی دار ☰ شاخەی نازک درخت

**ماتلی** / matlî/: ☜ **مارتین**

**ماتڵ** / matił/: ئاوەڵناو. مەحتەل: ١. دەسەوسـان؛ دەستەوسـان؛ دەستەوسـتان؛ بـێ کـار بـە هـۆی نەبوونی ئـامرازەوە ‹ماشـین نـەبوو، سـەعاتێک لـە شـەقامدا مـاتڵ بـووم› ٢. چـاوەڕوان؛ چـاوەنۆڕ؛ چاوەڕێ؛ چاقنێر؛ تەمادار؛ تەمایار؛ چەمەڕا ‹مـاتڵ بووم تۆ کارێکم بۆ بکەی› ☰ ١. مُعطل ٢. مُنتظر

⊡ **ماتڵ بون:** ١. دەسەوسان بـوون ٢. چـاوەڕوان بوون. هەروەها: **ماتڵ کردن** ☰ ١. مُعطـل شـدن ٢. مُنتظر بودن

**ماتڵی** / matiłî/: ناو. تەمایەری؛ چاوەنێری ‹تاقەتی ماتڵیم نەماوە!› ☰ مُعطلی

**ماتوڕا** / matuřa/: ☜ **ماتوڕە**

**مـاتوڕە** / matuře/: نـاو. *[پـلار]* مـاتوڕا؛ تەمـەڵ؛ تەوەزەل؛ کارنەکەر ☰ تنبل

**ماتۆڕ** / matoř/: ☜ **موتور**

**ماتۆڵکە** / matołke/: ☜ **مەلۆتکە**

**ماتـە** / mate/: نـاو. ١. کروشمـە؛ کـاری خـۆ کـز کردن ٢. ڕەوتی ئاو تێگەڕان و ئاڵ و بـۆڵ بـوونی میوەی بێستان ٣. تەمی بەر چاو ٤. کووژەکـەی چاوزار ☰ ١. کزکردگی ٢. علایم رسیدن در میـوەی پالیزی ٣. سیاهی پیش چشم ۴. مُهرەی چشمزخم

⊡ **ماتـە دان:** ١. خـۆ بـە زەوییـەوە لکانـدن و بـۆ دەرفـەت گـەڕان ‹پشـیلەیەکی ڕەش لـە پشـت پەرژینەکـە ماتـەی دابـوو› ٢. ئـاڵ و بـۆڵ بـوونی میوەی بێستان ☰ ١. به زمـین چسـبیدن و مُنتظـر فرصت بودن ٢. ظهور کردن علایم رسـیدن میـوەی پالیزی

**ماتە لێ دان:** *[کینایە]* سڵسـارد بوونـەوە؛ مـردن (تووکێکە) ‹هەی ماتەت لێ دا بۆ کـارێ کـردت› ☰ مُردن

**ماتە هەڵگرتن:** کز کردن و بۆ دانیشتن ‹چووینە نـاو دووکانـە چۆڵـێکەوە، ئاگرێکمـان کـردەوە و ماتەمان هەڵگرت «هـەژار، چێشـتی مجێـور»› ☰ مُترصد شدن

**ماتـەم** / matem/: ناو. سوێ؛ سـوو؛ سـۆ؛ ئازیـەت؛ ئازیـەتی؛ ئازیـەتباری؛ ئازیـە؛ تـازی؛ تازیـەباری؛ تازیانە ‹ئەوەڵ فەرەحی دا فەلەک، ئاخر غەمی هێنا/ گـوم بـوو لـە دەهـەن خەنـدە و دڵ ماتـەمی هێنـا «سالم»› ☰ سوگ؛ ماتم

⊡ **ماتەم گرتن:** ☜ **ماتەم گێران**

**ماتەم گێران:** ماتـەم گـرتن؛ ئازیـەتبار بـوون ‹شـەوێکی چـاوەنوارت بـووم نـەهاتی گیانەکـەم

ویستت/ منی دڵناسکی شاعیر بگیرم ماتەمێکی تر «هێمن»› 🇮🇷 سوگوار بودن

**ماتەمات** / matemat/: ئاوەڵکار. ماتە ـ ماتە؛ سەبرە ـ سەبرە 🇮🇷 پاورچین ـ پاورچین

**ماتە . ماتە** / matemate/: ☜ **ماتەمات**

**ماتەمبار** / matembar/: ئاوەڵناو. خەمبار 🇮🇷 غم‌زده

**ماتەمی** / matemî/: ☜ **ماتەمین**

**ماتەمین** / matemîn/: ئاوەڵناو. ماتەمی؛ تازیەبار 🇮🇷 سوگوار

**ماتەهەڵگرتوو** / matehełgirtû/: ئاوەڵناو. ١. کز کردوو ٢. خۆ داگرتوو 🇮🇷 ١. کِزکرده ٢. کمین کرده

**ماتی** / matî/: ناو. ١. سەرسووڕماوی ٢. کپی؛ بێدەنگی ٣. خەمباری؛ خەفەتباری ٤. بێ‌بریقەیی 🇮🇷 ١. تحیُّر ٢. خاموشی ٣. غمگینی ۴. ماتی

**ماتیک** / matîk/: ناو. ١. ماکێکی چەوری زۆرتر ڕەنگی بۆ ڕازاندنەوە و جوان‌کردنی لێو، لە دەفرێکی وەک لوولەدا ٢. ڕوژ؛ ئەو ماکە و جێگاکەی 🇮🇷 ١و٢. ماتیک

**ماتێن** / matên/: ☜ **کەلایێن**

**ماج** / mac/: ☜ **ماژ**

**ماجر** / macir/: ئاوەڵناو. کۆچەر 🇮🇷 مُهاجر

**ماجو** / macû/: ناو. کرێ؛ پاداش لە بەرانبەری کاردا 🇮🇷 مُزد

**ماجوج** / macuc/: پێرۆ. ← **ئاجوج و ماجوج**

**ماجووم** / macûm/: ☜ **ماجوون**

**ماجوون** / macûn/: ناو. ماجووم: ١. دەرمانی خۆراکی و هێزدەر، پتر وەکوو مرەبا یان هەڵوا کە لە تێکەڵاوکردنی چەند ماک بەرهەم دێ ٢. جۆرێ شیرنیات 🇮🇷 ١. معجون ٢. نوعی شیرینی

**ماجیستەر** / macîster/: ☜ **ماستەر**

**ماچ** / maç/: ناو. ١. ڕامووس؛ پاچ ٢. جگ؛ میچ؛ قاچ 🇮🇷 ١. بوسه ٢. شتالنگ؛ قاب

⊡ **ماچ دان**: ڕێ دان بۆ ماچ کران ‹قەت بووە عاشقی وەک وی لە سبەی تاکوو شەوێ/ بەتەما بێت و کەچی ماچێکی لێوی نەدەنێ؟ «ئاوات»› 🇮🇷 ماچ دادن

**ماچ کردن**: ڕامووسان؛ پاچ کردن ‹ئەمجار عەلی لە تەلەفۆنی شەوانەیدا دەیپرسی: گۆرانییە؟ یان قنگ بادان؟ یان سمێڵ ماچ کردن؟! «هەژار، چێشتی مجێور»› 🇮🇷 بوسیدن

**ماچا** / maça/: ناو. ناوی پەڕێک لە پەڕەکانی پاسوور 🇮🇷 از برگ‌های پاسور

**ماچان** / maçan/: ناو. ماچانێ؛ ماچێن؛ جگێن؛ قاپێن 🇮🇷 قاب‌بازی

**ماچانێ** / maçanê/: ☜ **ماچان**

**ماچک** / maçik/: ناو. سووکەڵە ماچ 🇮🇷 بوسەی کوچک

**ماچکە** / maçke/: ☜ **ماچە**

**ماچلەک** / maçlek/: ناو. بەندی ئەندام؛ گەی لەش 🇮🇷 مفصل

**ماچماچان** / maçmaçan/: ☜ **ماچماچانی**

**ماچماچانی** / maçmaçanî/: ناو. ماچماچان؛ ماچماچێن؛ ماچوو‌مووچ؛ کاری یەکتر ماچ کردن 🇮🇷 ماچ و بوسه

**ماچماچێن** / maçmaçên/: ☜ **ماچماچانی**

**ماچوومووچ** / maç û mûç/: ☜ **ماچماچانی**

**ماچە** / maçe/: ئاوەڵناو. مێوینە؛ ماچکە؛ ماچەک؛ ما؛ مێوینەی بڕێ گواندار ‹ماچەکەر› 🇮🇷 ماچه (استر و الاغ)

**ماچەک** / maçek/: ئاوەڵناو. ماچە؛ ماچکە؛ ما (هێسر و ولاخ) 🇮🇷 ماچه (استر و الاغ)

**ماچیک** / maçîk/: ناو. ماچ؛ ڕامووس 🇮🇷 بوسه

**ماچێن** / maçên/: ☜ **ماچان**

**ماحبەین** / maĥbeyn/: ☜ **مابەین**

**ماخ** / max/: ناو. ١. کاریتەی سەربان ٢. ڕیزە ئالوودار ٣. نزمی نێوان دو بەرزایی ٤. نهۆم؛

تەبەقە ﷼ ١. بالار ٢. الوارهای سقف ٣. پستی مـابین دوبلندی ۴. طبقه؛ اشکوبه

**ماخته** / maxte/: ناو. پڕخۆری؛ ئاوردمڵ؛ کولەش؛ نەخۆشی زراوی ئاژەڵ ﷼ بیماری کیسەی صـفرای حیوانات

**ماخولان** / maxulan/: ناو. ١. خولخوله؛ کـەرخۆل ٢. نەخۆشی سەر لـەرزین ﷼ ١. گردنا ٢. بیمـاری لقوەی سر

**ماخولیا**[1] / maxulya/: ناو. مـەیخوولی؛ ئەسـپەک؛ نەخۆشییەکی هزر و بیره نەخۆش تووشی ژاکان، خەیالات و وڕاوه دەکا ﷼ مالیخولیا

**ماخولیا**[2]: ئاوەڵناو. گێژ و حۆل ﷼ گیج و ویج

**ماخۆ** / maxo/: ناو. خاوەن؛ خودان؛ خێو؛ ساحێب؛ ساحێو ﷼ صاحب

**ماد** / mad/: ناو. ١. ماج؛ ناوێکی کـەونارای کـورد ٢. دەوڵەتی کورد لە هیگمەتانه، هەمەدانی کـۆن ﷼ ١. قوم ماد ٢. امپراطوری ماد

**مادا** / mada/: ☜ **مادە-٢**

**ماداک** / madak/: ناو. مـادەک؛ مانـگ؛ مـەدەک؛ گامێش ﷼ گاومیش

**مادام**[1] / madam/: ناو. ١. خامی ڕەشـی بریقـەدار ٢. سەرناوێکی فەڕانسـی بـۆ ژنـانی خـاوەن ڕێـز ‹مادام میتێران› ﷼ ١. متقالِ سیاه براّق ٢. مادام

**مادام**[2]: ئاوەڵکار. مـادەم: ١. هـەتا؛ تـا؛ تـا وایـە؛ ماوەیـەکی دیـاری نـەکراو ‹مـادام بترسـین، هـەر ئەمەیە› ٢. مەگەر ‹مادام تۆ بێی دەنا من ناچم› ﷼ ١. مادام ٢. مگر

**ماددی** / maddî/: ئاوەڵـناو. مـاکی: ١. لـە مـاک چێکراو ٢. پێوەندیدار بە ماک و ماڵـی دنیـاوە ﷼ ١و٢. مادی

**مادک** / madik/: ☜ **مەلۆتکە**

**مادوکی** / madukî/: ناو. سەردەمی ڕێـک کـەوتنی کۆتری نێر و مێ پێکەوە ﷼ موسم جفتگیری کبوتر

**مادە** / made/: ناو. ١. جۆرێ نان ٢. مادا؛ ڕفێدەی نان پێوەدان ٣. گـەدە؛ کـرش؛ عـوور ٤. دمـەڵ؛ کوان ٥. لوو؛ لک؛ گرێی گۆشت ٦. ☜ **مادەر** ٧. هەوێن؛ ئامیـان؛ ئـامێژەن ٨. ☜ **مـاک -١** ﷼ ١. نوعی نان ٢. بالشتک نانوایی ٣. معده ۴. دُمل ۵. غُـدّه ۶. ☜ **مادەر** ٧. خمیرمایه ٨. ☜ **ماک -١**

**مادەر** / mader/: ناو. دایـک؛ دالـک؛ ئـەدا؛ مـادە؛ مای؛ مایه؛ مەتار؛ مەتەر ﷼ مادر

**مادەربەچـە** / maderbeçe/: نـاو. تەقەڵـــی ورد و درشت پێکەوە بۆ جـوانی ﷼ کـوک زینتـی ریـز و درشت باهم

**مادەرزا** / maderza/: ☜ **مادەرزاد**

**مادەرزاد** / maderzad/: ئاوەڵـناو. مادەرزا؛ زگمـاک؛ سکماک؛ لەماوەرد؛ پێوەندیدار یا سەر بە کاتی لە دایک بوون. هەروەها: **مادەرزادی** ﷼ مادرزاد

**مادەرمەردە** / madermerde/: ناو. میوەی بێستانی سیس‌هەڵگەڕاوی پڵیخاو ﷼ میوەی پالیزی لهیده

**مادەک** / madek/: ☜ **ماداک**

**مادەم** / madem/: ☜ **مادام**[2]

**مادەن** / maden/: ☜ **مەعدەن**

**مادی**[1] / madî/: ناو. ١. زمانێک کە لە وڵاتی مـاددا باو بووه و تا ئێستاکە ئاسەوارێکی سەربەخۆی لێ نەدۆزراوەتـەوە ٢. جۆگەلـەیێ کـە لـە چـۆم و ڕووباران جـوێ دەکرێتـەوە ﷼ ١. زبـان مـادی ٢. جویی که از رود منشعب می‌کنند

**مادی**[2]: ئاوەڵناو. ١. پێوەندیـدار یـان سـەر بـە مـاد ‹زمانی مادی› ٢. خەڵکی ماد ﷼ ١و٢. مادی

**مادینە** / madîne/: ناو. مێوینە؛ مێنگە ‹ئەر مادینـە بۆ نە گیسوش ببەند/ وە لاش بمانۆ تا بە وەخت چەند «*شانامەی کوردی*، هەورامی»› ﷼ مادینه

**مادێ** / madê/: ناو. ڕفێدە؛ مادە؛ مایە ﷼ رفیده

**مار** / mar/: نـاو. ١. مۆر؛ مەعر؛ گیانەوەری خزۆکـی بێ‌دەست و پێ بە جەستەی درێژی پوولەکدارەوە،

هێلکەکەرن و زۆربەیان ژەهردارن ٢. ماڵ؛ خانوو؛ جێگەی لێ ژیانی خێزان ٣. /کینایە/ مرۆی سەگ و پێوەدەر ‹مارێکە نەبێتەوە› ≛ ١. مار ٢. خانە ٣. آدم موذی

▣ **مارۆ سیا**: ١. ماری ڕەش ٢. /کینایە/ مرۆی دژی قینەوون ≛ ١. مار سیاه ٢. دشمن کینەتوز

**ماری بەڵەکە**: ماری خاڵبەڵەک؛ ماری ڕەشی خاڵ سپی ≛ مار پیسە

**ماری پشت**: ☜ **مۆرەغە**

**ماری خاڵبەڵەکە**: ☜ **ماری بەڵەك**

**ماری زەنگی**: ماری ڕەش؛ ڕەشمار ≛ مار زنگی

**ماری کتکی**: جۆرێ ماری ژەهراوی مەترسیدار ≛ نوعی مار سمی

▣ **مار برین**: ☜ **مارە برین**

**مار پێوەدان**: مار گەستن ≛ مار زدن

**مار کرن**: ☜ **مارە برین**

**مار لە کون دەرهێنان/ دەرکێشان**: /کینایە/ زۆر بە سەر و زمان بوون ≛ مار از سوراخ بیرون کشیدن

**مارافی** / maravî/: ☜ **مارماسی**

**مارال** / marał/: ناو. غەزاڵ؛ کەژاڵ؛ خەزاڵ ≛ غزال

**ماران** / maran/: ناو. ساردداوە؛ سارداو؛ سەرداو ≛ سردابە

**مارانگاز** / marangaz/: ☜ **مارانگەز**

**مارانگەز** / marangez/: ناوەلناو. مارانگاز؛ مارزەیە؛ مارانگەستە؛ مارگەستی؛ مار پێوەداو ‹هەرکەسێ هات و وتی من عاشقم بڕوا مەکە/ تا لە سەر گۆنای نیشانی زەخمی مارانگەز نەبێ «تاهیر بەگی جاف»› ≛ مارگزیدە

**مارانگەزی** / marangezî/: ناو. مارگەستەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی مار پێوەدان ≛ مارگزیدگی

**مارانگەستە** / marangeste/: ☜ **مارانگەز**

**مارئاو** / maraw/: ناو. هات؛ بەخت ≛ شانس

**ماراوی** / marawî/: ☜ **مارماسی**

**ماربرژێن** / marbirjên/: ناو. /کینایە/ ژنی بێحەیا ≛ سلیطە

**مارپێچ** / marpêç/: ناو. ١. مارمارۆک؛ مارپێچ؛ کەوانەیێ کە بەردەوام لە ناوەندی دوور و نزیک دەکەوێتەوە ٢. لوولەی درێژی قلیانئاوی ≛ ١. مارپیچ ٢. مارپیچ قلیان

**مارت** / mart/: ☜ **مارس ـ١**

**مارتاک** / martak/: ☜ **مەردیاق ـ٢**

**مارتلی** / mart(i)lî/: ☜ **مارتین**

**مارتۆڵەکێ** / martołekê/: ناو. تۆڵەکەمارانە ≛ افسنتین کبیر

**مارتوولە** / martûle/: ناو. ١. توولەمار؛ بەچکەمار ٢. ماری باریک ٣. کرمی درێژی ناو سک ٤. مارمێلکە؛ مارمزووک ≛ ١. بچەمار ٢. مار باریک ٣. کرم دراز رودە ۴. مارمولک

**مارتین** / martîn/: ناو. مارتلی؛ ماتلی؛ جۆرێ تفەنگ ≛ نوعی تفنگ

**مارجوو** / marcû/: ☜ **مەرزی**

**مارجەفری** / marcef(i)rî/: ☜ **کەوەمار**

**مارجێوە** / marcêwe/: ناو. مەیدانی خشت پێژان ≛ میدان خشتزنی

**مارچ** / març/: ☜ **مارس ـ١**

**مارچۆوە** / marçowe/: ☜ **مارچێوە**

**مارچێو** / marçêw/: ☜ **مارچێوە**

**مارچێوە** / marçêwe/: ناو. مارگرە؛ مارگیرە؛ مارەگیرە؛ مارچۆوە؛ مارچێو: ١. چاومارە؛ شەفەلە؛ کەبەر؛ ترچک؛ گیاگوڵەنگ؛ گیایەکی پایای لق و پۆ دەرزی، بە گەڵای پوولەکەیی و گوڵی سپی یان سەوز و بەری سوورەوە کە ساقەتەکەی دەخورێ، چەند جۆرێکیشی جوانە و بۆ ڕازاندنەوە دەبێ ٢. داری سەر دووفلیقانە بۆ مار گرتن ≛ ١. مارچوبە ٢. چوب دوشاخەی مارگیرها

**ماردا** / marda/: ☜ **مردوو**

**ماردش** / mardiş/: چاوگ. ١. مردن ٢. دوایی هاتن؛ تەواو بوون ☰ ١. مُردن ٢. تمام شدن

**ماردن** / mardin/: چاوگ. شکاندن ☰ شکستن

**ماردە** / marde/: ☜ **مردوو**

**ماردەم**[١] / mardem/: ناو. جۆرێ تفەنگ ‹سوب نە سەر هەردان سەیادان هامدەم/ شریخەی ماردەم کلافەی کەلّەم «مەولەوی»› ☰ نوعی تفنگ

**ماردەم**[٢]: ناوەلّناو. باریک و ڕەقەڵە ☰ لاغر

**مارزا** / marza/: ☜ **مارەزا**

**مارزەیە** / marzeye/: ☜ **مارانگەز**

**مارزیای** / marz(i)yay/: ناوەلّناو. بەجێهێلّراو؛ تەرک‌کراو ☰ متروک؛ مهجور

**مارژۆک** / marjok/: ناو. بووکمار؛ جۆرێ مارمێلکە ☰ نوعی مارمولک

**مارژی** / marjî/: ☜ **مەرژی**

**مارس** / mars/: ناو. ١. مارت؛ ئادار؛ ئازار؛ مارچ؛ مانگی سێهەم لە ساڵی زایینی بە ٣١ ڕۆژەوە کە لە دەی ڕەشەمەوە دەس پێ دەکا ٢. دۆڕانێکی دوو بەرامبەر لە کایەی تەختەدا کاتێ کە لایەنێ هەموو مۆرەکانی هەڵگرتبێ و ئەوی دی هیچی هەڵنەگرتبێ ‹ئەم دەستیشە مارس بووی!› ☰ ١. ماه مارس ٢. مارس (تختەنرد)

**مارش** / marş/: ناو. ئاهەنگی مووسیقای دوو یان چوار زەربی بۆ ڕێک خستنی هەنگاوەکانی هێزی چەکدار لە ڕێژە، یان دنەدانیان بۆ شەڕ ☰ مارش

**مارشاڵ** / marşał/: ناو. ئەفسەری ئەرشەد بە پلەکی چەکداری بەرانبەر بە سپەهبود ☰ مارشال

**مارشێوک** / marşêwik/: ناو. سووسەمار؛ بزنمژ؛ بزنمژک؛ بزن‌چەکێنە ☰ سوسمار

**مارک** / mark/: ناو. ١. وێنە یان نیشانەی تایبەتی دامەزراوەیێ کە لە سەر بەرهەمێک دەدرێت ٢. یەکەی پارەی ئاڵمان، پێش یورۆ ☰ ١و٢. مارک

**مارکسیست** / marksîst/: ناو. هۆگری مارکسیسم؛ بڕوامەند بەو بناغە فیکرییانەی کارل مارکس دایناوە ☰ مارکسیست

**مارکسیسم** / marksîsm/: ناوەلّناو. ئامۆژەی فەلسەفی ـ ڕامیاری کارل مارکس (١٨١٨ـ١٨٨٣ زایینی) فەیلسووفی بەناوبانگی ئەڵمانی، لە سەر بنەمای ماتریالیسم و سوسیالیزم ☰ مارکسیسم

**مارگارین** / margarîn/: ناو. جۆرێ کەرەی دەسکرد لە ڕۆنی پاڵێوراوی گیا، شیر، ئاو و ماکیتر (وەک: زەردێنەی هێلکە، کەیزین، ویتامین و ماکی ڕەنگی) ☰ مارگارین

**مارگر** / margir/: ناو. مارگیر؛ ئەوەی کاری ڕاوەمارە ☰ مارگیر

**مارگرۆس** / marg(i)ros/: ناو. نێرەکەوێ کە ماکەوەکەی لێ بزر بووە ☰ کبک نری کە مادەاش را نمی‌یابد

**مارگرە** / marg(i)re/: ☜ **مارچێوە**

**مارگەستەیی** / margesteyî/: ☜ **مارانگەزی**

**مارگەستی** / margestî/: ☜ **مارانگەز**

**مارگیر** / margîr/: ناو. ١. گیایەکی دڕکاوییە ٢. ☜ **مارگر** ☰ ١. گیاهی است خاردار ٢. ☜ **مارگر**

**مارگیرە** / margîre/: ☜ **مارچێوە**

**مارگیس** / margîs/: ناو. مارگیسک؛ جۆرێ مارمێلکە ☰ نوعی مارمولک

**مارگیسک** / margîsk/: ناو. ١. ☜ **مارگیس** ٢. ماری ژەهردار ٣. *[کینایە]* مرۆی بێ‌فەڕ و خراپ ☰ ١. ☜ **مارگیس** ٢. مار سمی ٣. شخص بدجنس و ناهنجار

**مارگیسە** / margîse/: ناو. بۆقلە؛ بەقلەمووت؛ عەلەشیش؛ عەلۆ عەلۆ ☰ بوقلمون

**مارمارک** / marmarik/: ناو. کرمی درێژی ناو سک ☰ کرم دراز معده

**مارمارۆشک** / marmaroşk/: ناو. ١. ☜ **مارمێلکە**

٢. گیایەکە شیرەکەی ژەهرە ■ ١. ☜ مارمێلکە ٢. گیاهی با شیرەی سمّی

**مارمارۆک**[1] / marmarok/: ☜ **مارمێلکە**

**مارمارۆک**[2]: ئاوەڵناو. درێژ و بەپێچ وەکوو مار ■ دراز و پیچ - پیچ

**مارمارۆکە** / marmaroke/: ناو. نانی بازنەیی ■ نان حلقەای

**مارماساو** / marmasaw/: ☜ **مارماسی**

**مارماسە** / marmase/: ☜ **مارماسی**

**مارماسی** / marmasî/: ناو. مارماسە؛ ماراقی؛ ماراوی؛ مارماساو؛ جۆرێ ماسی کە لە مار دەکا بەڵام چزی نییە و موسوڵمانیش گۆشتی دەخۆن ■ مارماهی

**مارمالاد** / marmalad/: ناو. جۆرێک مرەبای چەرخکراوی خەستوخۆڵ لە میوەی ئاودار ■ مارمالاد

**مارمالووک** / marmalûk/: ☜ **مارمێلکە**

**مارمردگ** / marmirdig/: ناو. *[کینایە]* لە بەرەو باجی لە بنەو قەیچی؛ مرۆڤی بە ڕواڵەت فەقیرۆکەی لە بنەوە بڕ ■ آدم به ظاهر مظلوم و در واقع بدذات

**مارمزووک**[1] / marm(i)zûk/: ناو. ١. بێچووە مار ٢. ☜ **مارمێلکە** ■ ١. بچەمار ٢. ☜ **مارمێلکە**

**مارمزووک**[2]: ئاوەڵناو. *[کینایە]* بەدفەڕ و فێڵباز ■ موذی

**مارمژ**[1] / marmij/: ناو. مارمێژ؛ کاری دەم بە جێگەی مارانگەستەوە نان و لووشینی زار بۆ چارەی مارانگاز ■ عمل مکیدن جای نیش مار به قصد معالجه

**مارمژ**[2]: ئاوەڵناو. *[کینایە]* مارمێژ: ١. کز و داڵگۆشت ٢. بێحەیا (ژن) ■ ١. لاغرمُردنی ٢. سلیطه

**مارمژیو** / marm(i)jîw/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* مارمژ؛ کز و لاواز ■ لاغرمُردنی

**مارملیک** / marm(i)lîk/: ☜ **مارمێلکە**

**مارموور** / marmûr/: ☜ **مارومێروو**

**مارمەزووک** / marmezûk/: ☜ **مارمێلکە**

**مارمەزووکە** / marmezûke/: ☜ **مارمێلکە**

**مارمێزولکە** / marmêzulke/: ☜ **مارمێلکە**

**مارمێژ** / marmêj/: ☜ **مارمژ**

**مارمێلک** / marmêlik/: ☜ **مارمێلکە**

**مارمێلکە** / marmêlke/: ناو. مارمێلک؛ مارملیک؛ مارمێلۆک؛ مارمارۆک؛ مارمالووک؛ ماریلە؛ مارمارۆشک؛ مارمزووک؛ مارمەزووک؛ مارمەزووکە؛ مارمێزولکە؛ مزوک؛ مەرمەریشۆک؛ مەزووکە؛ جانەوەرێکی پچووکی بۆرەڵووکەیە لە کورتەمار دەکاو دەست و پای هەیە بە مێش و جانەوەری پچووک دەژی و پێوە نادا ■ مارمولک

**مارمێلۆک** / marmêlok/: ☜ **مارمێلکە**

**مارنەگەز** / marnegez/: ناو. بەلەکپێچی لباد ■ ساق‌پیچ نمدی

**مارنەینک** / marneynik/: ناو. جۆرێ مارە ■ مار عینکی

**ماروپیر** / mar û pîr/: ناو. *[ناشیرین]* جوێنێکە (واتا: شەرمی دایکت) ■ دشنامی است

**ماروتە** / marute/: ناو. قولاخە؛ خزگەی ماسی لە زستاندا ■ پناهگاه ماهیان در زمستان

**مارودو** / mar û dû/: ئاوەڵناو. قیلەوقاچ؛ فیچەڵفاچ ■ مورب

**مارول** / marul/: ناو. خاس؛ کاهوو ■ کاهو

**ماروموور** / mar û mûr/: ☜ **مارومێروو**

**مارومێروو** / mar û mêrû/: ناو. جرِوجانەوەر؛ مارموور؛ ماروموور؛ سەرجەمی خزۆک و مێروو ‹دەرمانی مارومێروو› ■ جانور

**مارۆ**[1] / maro/: ناو. ☜ **مارۆکە**

**مارۆ**[2]: ئاوەڵناو. ١. قەشان؛ ڕەشی ناوچاو سپی (ئاژەڵ) ‹گای مارۆ› ٢. بە خاڵی سپی لە پایدا (ئەسپ) ■ ١. سیاه پیشانی سفید (دام) ٢. با خال‌های سفید در دست و پا (اسب)

**مارۆخه / maroxe/**: ناو. پارچـه زەوی بچـووک ☰ قطعه زمین کوچک

**مارووژە / maruje/**: ☜ **مارێژه**

**ماروکه / marûke/**: ناو. مارۆ؛ پارچەیەکی قەدیمی ژنانه ☰ پارچەای قدیمی زنانه

**ماره / mare/**: ناو. ماهره؛ مەهر؛ کاری ژن به پیاو دان به پێی ڕێوشوێنی ئایینی ☰ عقد ازدواج

⊡ **ماره برین**: ماره کـردن؛ مـار کـرن/ بـڕین؛ ژن کردنه حەلاڵی پیاو به ڕێوشوێنی ئاینی ‹هـەر مەلای بۆڕێ مـارەی نـەوەدل/ ڕیشـەگەی بـۆڕین بنینەی شەتل «فولکلۆر»› ☰ عقد کردن

**ماره کردن**: ☜ **ماره برین**

**مارەبڕ / marebiř/**: نـاو. ١. کچێ کە بە زارۆکی بە شوو دراوه ٢. ئەوی بووک و زاوا لێک ماره دەکـا ☰ ١. دختر عقدشدەی نابالغ ٢. عاقد

**مارەبڕانه / mareb(i)řane/**: ☜ **مارەیی**

**مارەبڕاو / mareb(i)řaw/**: ئاوەڵـناو. مارەبـڕیاگ؛ مارەکراو؛ بە شوو دراوی هێشتا نەگوزراوه ☰ عقد کرده

**مارەبڕی / mareb(i)řî/**: ☜ **مارەیی**

**مارەبڕیاگ / marebiřyag/**: ☜ **مارەبڕاو**

**مارەزا / mareza/**: نـاو. مـارزا؛ پیسـایی زارۆ لـە سەرەتای لـە دایـک بوونیـدا (بەتایبـەت بێچـووی ئاژەڵ) ☰ مامیزه

**مارەزیله / marezîle/**: ☜ **مارەزیو**

**مارەزیو / marezîw/**: ناو. مارەزیله؛ زێلوو؛ هەزارپێ ☰ هزارپا

**مارەقان / mareqan/**: ناو. هەلالە؛ گـەردەی گـوڵ ☰ گردەی گُل

**مارەک / marek/**: ☜ **موبارەك**

**مارەکراو / marek(i)raw/**: ☜ **مارەبڕاو**

**مـارەکوشـه / marekuşe/**: نـاو. زڕگێژنـۆک؛ شەوکەران ☰ شوکران

**مارەکۆڵ / marekoł/**: ناو. دومارەکول؛ دمـارەکۆڵ؛ دووپشک ☰ عقرب

**مـارەکـه / mareke/**: نـاو. زیـن: ١. کەرەسـتەی سەرپشتی ئەسـپ لـە کـاتی سـواریدا ٢. جێـی دانیشتن لە سەر موتور و دووچەرخه ☰ ١و٢. زین

**مارەکەو / marekew/**: ناو. سوێسکه؛ تەیهوو ☰ تیهو

**مـارەگوێز / mareg(i)wêz/**: ناو. تیرەی درێژی ئـاو بۆ سەر گۆلەمەرەزه ☰ جوی بلند آبرسانی به کـرت شالیزار

**مارەگیره / maregîre/**: ☜ **مارچێوه**

**مارەیژه / mareyje/**: ☜ **مارێژه**

**مارەیی / mareyî/**: ناو. مارەبڕانه؛ مارەبـڕی؛ مـاره؛ میەره؛ ماکەله؛ نکا؛ کاوین؛ ئەو بەشـە لـە دارایـی کە پیاو لە کاتی ژن هێناندا پێشکەشی ژنەکـەی دەکا یان بڕیار دەدا بیداتێ ☰ صداق؛ مهریه

**ماری / marî/**: ☜ **ماکەو**

**ماریجوانـا / marîc(i)wana/**: نـاو. وشـکەوەکراوی گەڵا و سەر لقوپۆی گیای شادانه کە لە بەر سڕکەر بوونی وەکوو جگەره دەیکێشن ☰ ماریجوانا

**مارێژۆک / marîjok/**: ☜ **مارێژه**

**مارێژه / marîje/**: نـاو. ماروژه؛ مارێژۆک؛ مارەیژه؛ گیایەکە دەخورێ ☰ گیاهی خوردنی

**ماریس / marîs/**: ☜ **مارس**

**مارستان / marîstan/**: ناو. شوێنێ کە مـاری زۆره ☰ جایی که مار بسیار دارد

**ماریشـۆک / marîşok/**: نـاو. مارمێلکـەی زەلام ☰ مارمولک بزرگ

**ماریفـەت / marîfet/**: نـاو. ڕووخۆشـی و ئاکـار پەسندی ‹پیاوێکی بەماریفەته› ☰ خوش اخلاقی

**ماریله / marîle/**: نـاو. ١. ☜ **مارمێلکـه** ٢. ئـاوی کـەمی چـۆم و کـانی ☰ ١. ☜ **مارمێلکـه** ٢. آب اندک رود و چشمه

**مارین / marîn/**: ناو. گیایەکە ☰ گیاهی است

**ماڕای** / mařay/: ☜ **ماڕتەی**

**ماڕتەی** / mařtey/: چاوگ. ماڕای؛ شکاندن؛ شکانن ☰ شکستن

**ماڕز** / mařiz/: ☜ **ماڕس**

**ماڕس** / mařis/: ناوەڵناو. ماریس؛ ماڕز: ١. زاڵم؛ ناحەقیکار ٢. لاسار؛ سەرڕەق ☰ ١. ستمگر ٢. لجباز

**ماڕکە** / mařke/: ☜ **ڕاوکە**

**ماڕە** / maře/: ☜ **ڕاوکە**

**ماڕین** / mařîn/: چاوگ. شکاندن ☰ شکستن

**ماڕێ** / mařê/: ناو. چوخم؛ ژووری سەر ڕێڕەوی کووچە ☰ اتاق بالای کوچە

**ماڕێواس** / mařêwas/: ناو. لەقلەقە؛ ڕیواسی بن بەرد؛ نێرتکە ڕێواس ☰ نوعی ریواس

**ماز** / maz/: ناو. ١. ☜ **ماژ** ٢. لووتکە؛ دوند ☰ ١. ☜ **ماژ** ٢. قُلە

**مازان** / mazan/: ناوەڵناو. ١. ☜ **مەزن** ٢. ناوچاوان و کلک سپی (کەڵ و گامێش) ☰ ١. ☜ **مەزن** ٢. پیشانی و دُم سفید (گاومیش)

**مازبەر** / mazber/: ناو. نەخۆشییەکە لە سمی ئاژەڵ پەیدا دەبێ ☰ از بیماری‌های سُم دام

**مازتر** / maztir/: ☜ **ماستر**

**مازگ** / mazig/: ☜ **مازوو ـ١**

**مازگا** / mazga/: ناو. پێشەی کلێنچکە ☰ استخوانِ دنبالچە

**مازگە** / mazge/: ☜ **مۆرەغە**

**مازڵوخ** / mazłux/: ناو. دوگرد؛ بەرماڵی نوێژ ☰ سجادە؛ جانماز

**مازڵۆخ** / mazłox/: ناو. بەرماڵ؛ جانماز؛ دووگرد ☰ سجّادە

**مازماز** / mazmaz/: ناو. بەرانی فەحل؛ بەرانێ کە دە پەزی بەر دەدەن ☰ راک گُشن

**مازن** / mazin/: ☜ **مەزن**

**مازوخیسم** / mazuxîsm/: ناو. [دەروونناسی] ئازارخوازی؛ جۆرێک ئاڵۆزاوی دەروونی کە نەخۆش بە ئازاردران و سووکایەتی پێ کران لە لایەن گراوییەکەیەوە کاژێر دەبێ و دادەمرکێ.

هەروەها: **مازوخیست** ☰ مازوخیسم

**مازور** / mazur/: ناوەڵناو. بەتاڵ؛ بێکار ☰ بیکار

**مازوو** / mazû/: ناو. ١. مازگ؛ مازی؛ مازووچ؛ گولێر؛ بەری دار مازوو ٢. پشکیل؛ هەڵماتی جۆرابێن ☰ ١. مازوج ٢. تیلەی جوراب‌بازی

**مازووبەرەڵا** / mazûbereła/: ناو. ١. وشەیەکە بۆ بە ئازادی مازوو لێکردنەوە دەگوترێ ٢. [کینایە] بشێوە و کەس‌لەکەسی ‹مازووبەرەلایەکە کەس ئاگای لە کەس نییە!› ☰ ١. واژەی اعلام مازوچینی آزاد ٢. هرج‌ومرج و بی‌قانونی

**مازووت** / mazût/: ناو. شاپلیتە؛ مەشخەڵ ☰ مشعل

**مازووچ** / mazûç/: ☜ **مازوو**

**مازووچن** / mazûçin/: ناو. مازیچن؛ کەسێ کە مازوو لە دار دەتەکێنێ و کۆی دەکاتەوە ☰ مازوچین

**مازووچنان** / mazûç(i)nan/: ناو. کاتی مازوو چنینەوە ‹کیتان کوری مەیدانە/ یاڵلا مازووچنانە! «قانع»› ☰ مازوچینی

**مازوودار** / mazûdar/: ناو. مازووڤان؛ دار مازوو ☰ درخت مازوج

**مازووڤان** / mazûvan/: ☜ **مازوودار**

**مازوولیکێش** / mazûlîkêş/: ناو. [کینایە] دۆستی بە ئەمەگی کۆنەکاربەدەست ☰ دوست وفادار در زمان معزولی

**مازە** / maze/: ناو. ١. ☜ **مۆرەغە** ٢. شان؛ پیل ٣. دارێ کە چەرخی عارەبەی پێوەیە و دەگەڕێ ☰ ١. ☜ **مۆرەغە** ٢. کتف ٣. چوب محور چرخ‌های گاری و ارابە

**مازەپشت** / mazepişt/: ناو. تیرەغە؛ مۆغەرە ☰ ستون فقرات

**مازی** / mazî/: ناو. ١. ☜ **مازوـ١** ٢. ☜ **مۆرەغە**

**مازیچن** / mazîçin/: ☜ **مازوچن**

**مازیر** / mazîr/: ناو. سمەشلە؛ نەخۆشی سمی ئاژەڵ ☰ بیماری سُم دام

**مازێر** / mazêr/: ناو. داربەڕووی ئەستوور ☰ درخت بلوط تنومند

**ماژ** / maj/: ناو. ماج؛ ماز؛ پەیڕەوی زەردەشت ☰ پیرو زردشت

**ماژە** / maje/: ناو. ڕوخسار؛ دیم؛ دەموچاو ☰ چهره

**ماژیک** / majîk/: ناو. ناوی بازرگانی جۆرێک قەڵەم بە مەرەکەفدان و نووکی لبادەوە (بۆ مژین و دەردانی مەرەکەف) کە زۆرتر بۆ نووسین بە خەتی گەورە و نیگارکێشان دەبێ ☰ ماژیک

**ماس** / mas/: ناو. ١. ☜ **ماست** ٢. پەنەم؛ پەنام ☰ ١. ☜ **ماست** ٢. آماس

**ماسا** / masa/: ☜ **ماسی[١]ـ١**

**ماساژ** / masaj/: ناو. مەساج؛ لەپماڵ؛ وەرژۆ؛ کاری شێلانی ماسوولکەی لەش بە دەست یان هەر کەرستەیەکی‌تر بۆ دەرمان و حەسانەوە ☰ ماساژ

**ماساژۆر** / masajor/: ناو. ئەو کەسەی کاری ماساژ دانە ☰ ماساژور

**ماسان** / masan/: ☜ **ماسین ـ١**

**ماساندن** / masandin/: چاوگ. هەڵپفاندن؛ ئاوساندن؛ با تێ‌کردن ☰ آماساندن

**ماساو[١]** / masaw/: ناو. ١. ☜ **ماسی[١]ـ١** ٢. ☜ **ماستاو**

**ماساو[٢]**: ☜ **ماسیو**

**ماساوگیر** / masawgîr/: ☜ **ماسیگر**

**ماساوە** / masawe/: ناو. گیایەکی تام‌تیژە ☰ گیاهی تُندمزه

**ماساوی** / masawî/: ☜ **ماسی[١]ـ١**

**ماسای** / masay/: چاوگ. ماسین ☰ آماسیدن

**ماسایا** / masaya/: ☜ **ماسایش**

**ماسایە** / masaye/: ☜ **ماسایش**

**ماسایش** / masayîş/: چاوگ. ماسین؛ پەنەمیان؛ ماسای؛ ماسایا؛ ماسایە؛ ئەستوور بوون ☰ آماسیدن

**ماست** / mast/: ناو. ماس؛ مۆست؛ مێست؛ ترۆلە؛ ترۆڵە؛ شیری هەوێن‌کراو و گرساو کە خواردنێکی هەموانییە ☰ ماست

▣ **ماست و مو بژاردن**: *[کینایە]* بە وردی توێژینەوە لە کارێ، بەتایبەت لە خەرج و داهاتدا ☰ مو از ماست کشیدن

**ماست نەبرین**: *[کینایە]* زۆر کول بوون (تیغ) ☰ کُند بودن

**ماستاڤ** / mastav/: ☜ **ماستاو**

**ماستاو** / mastaw/: ناو. ماساو؛ ماستاڤ؛ ئاوماس؛ ئاوەماست؛ ماستی لە ئاودا لێکدراوی بە مەشکە نەژنراو ☰ آبدوغ؛ ماست و آب بەهم‌زده

▣ **ماستاو سارد کردنەوە**: *[کینایە]* ماستاو کردن؛ پیاز پاک کردن؛ ڕووبینی و کلکەسووتە کردن ☰ چاپلوسی کردن

**ماستاو کردن**: ١. ماستاو ساز کردن ٢. ☜ **ماستاو سارد کردنەوە** ☰ ١. آبدوغ درست کردن ٢. ☜ **ماستاو سارد کردنەوە**

**ماستاوکەر** / mastawker/: ناو. *[کینایە، پلار]* ئاشماڵ؛ جاملووس؛ دەڤ‌حلوی؛ لالکەر ☰ مُتملق

**ماستاوکەری** / mastawkerî/: ناو. *[کینایە، پلار]* خولتە؛ دەڵەچەیی؛ مەرایی؛ کلکەسووتە؛ کلکەفلێ؛ کلکەلەقێ ☰ تملُق؛ چاپلوسی

**ماستاوی** / mastawî/: ئاوەڵناو. ماسی؛ بە ماستەوە تلاو ☰ آغشته به ماست

**ماستبا** / mastba/: ناو. دۆخەوا؛ دۆخوا؛ دۆکلیو ☰ دوغبا

**ماستبڕ** / mastbiř/: ناو. سمەشلە؛ نەخۆشییەکی ئاژەڵە ☰ از بیماری‌های دام

**ماستر** / mastir/: ئاوەڵناو. مازتر؛ گەپتر؛ زلتر؛

مەزنتر؛ گەورەتر 🇮🇷 بزرگتر

**ماسترِوون** / mastřûn/: ☜ **ماستەڕۆن**

**ماستفرۆش** / mastf(i)roş/: ☜ **ماسی١ـ٢**

**ماستودۆشاو** / mast û doşaw/: نـاو. جۆرێـک مووروی دوورەنگە بۆ تـەزبێح 🇮🇷 نـوعی مُهـرەی تسبیح

**ماستەر** / master/: نـاو. ماجیسـتەر؛ ماسـتیر؛ فەوق‌لیسانس 🇮🇷 فوق لیسانس؛ کارشناسی ارشد

**ماستەرگ** / masterg/: ☜ **ماستێر**

**ماستەڕۆن** / masteřon/: نـاو. ماسـتڕوون؛ توێژـ توێژی ماست و ڕۆن لە سەر یەک، کـە بۆ زسـتانی هەڵـدەگرن 🇮🇷 لایـە ـ لایـەهـای ماست و کره بر هم برای ذخیرەی زمستانی

**ماستیر** / mastîr/: ☜ **ماستەر**

**ماستێر** / mastêr/: ناو. ماستەرگ؛ کۆفک؛ کوفـک؛ ڕاحـەتی؛ ڕەحـەتی؛ ڕەحـاتی؛ بـەتوو؛ سـەرتلک؛ سـەرتلیک؛ خۆنـک؛ ئـامرازێکی زارهـەراوی بن‌تەنگە، تراوی پێ لـە دەفـری زار تـەنگ (وەک بوتری) دەکەن 🇮🇷 قیف

**ماسریشم** / mas(i)rîşm/: ناو. سریشێ کە لە ماسی دەگیرێ 🇮🇷 چسبی که از ماهی گیرند

**ماسرێشمە** / mas(i)rêşme/: ناو. گیاچرێش 🇮🇷 گیاه سریش

**ماسک** / mask/: ناو. ماسکە؛ دەمامک: ١. ڕووبەند؛ پەچە؛ پێچە؛ پووشی؛ ڕووبەنە ٢. ئەوەی کۆسـتە، ڕووی پێ دەگرێ و خۆی پێ دەگۆڕێ ٣. جۆرێ پاڵوێنەیە دەم و لووتی پێ دەگرن تا کۆئەنـدامی هەناسەدان بپارێزێـت ٤. کەرسـتەیێ کـە کـاتی کارکردن، دەم و چاو لە گەزن دەپارێزێ 🇮🇷 ١تا٤. ماسک

**ماسکە** / maske/: ☜ **ماسک**

**ماسکەش** / maskeş/: ناو. *[ناشیرین]* دەویـت؛ گـەواد 🇮🇷 جاکش

**ماسلکە** / masilke/: ☜ **ماسی١ـ١**

**ماسڵە** / masłe/: ناو. گریس 🇮🇷 گریس

**ماسماڵی** / masmałî/: نـاو. *[کینایـە]* ١. کـاری پۆشینی تاوان بە نارەوا ٢. ڕەوتی بە ڕواڵەت سەر و بنی کار هێنانە یەک ٣. کاری ماست بـە سـەر ژنی خراپدا کردن و بە ناو خەڵـکدا گەڕانـدن 🇮🇷 ١و٢. ماستمالی ٣. عمـل ماسـت بـر سـر زن بـدکاره ریختن و در جمع گرداندن

**ماسمێژ** / masmêj/: ☜ **ماسمێش**

**ماسمێش** / masmêş/: ناو. ماسمێژ؛ سیس؛ جـۆرێ مێشە لە مێشەنگوین دەچێ 🇮🇷 نوعی مگس شبیه زنبور عسل

**ماسـنای** / masnay/: چـاوگ. پەنەمانـدن؛ هەڵتۆقاندن 🇮🇷 متورم کردن

**ماسورا** / masura/: نـاو. ١. مـاس؛ پەنـەماوی ٢. نەخۆشی بای سوور 🇮🇷 ١. ورم ٢. بیماری باد سرخ

**ماسول** / masul/: ناو. ١. ☜ **ماسی١ـ١** ٢. پلـیتە چـرا ٣. داهـاتی زەوی 🇮🇷 ١. ☜ **ماسی١ـ١** ٢. فتیله ٣. محصول زمین

**ماسولکە** / masulke/: ☜ **ماسولکە ـ١**

**ماسۆ** / maso/: ☜ **ماسی١ـ١**

**ماسۆلە** / masole/: ☜ **ماسولە**

**ماسـۆڵە** / masołe/: نـاو. ١. ماسـوور؛ ماسـوورە؛ ماسـوولکە؛ مەسـوورە؛ ماسـوولکەی جـۆلایی ٢. ☜ **ماسـولکە ـ١** ٣. جـۆرێ سـاج ٤. گلۆلـەی فرێت 🇮🇷 ١. ماسوره ٢. ☜ **ماسولکە ـ١** ٣. نـوعی ساج ۴. گلولەی نخ پود قالیبافی

**ماسور** / masûr/: ناو. ١. بەری دارێکـی دڕکاوییـە لە عـەنناب دەکـا ٢. ☜ **ماسـۆڵە ـ١** 🇮🇷 ١. ثمـر درختی شبیه عناب ٢. ☜ **ماسۆڵە ـ١**

**ماسورە** / masûre/: ☜ **ماسۆڵە ـ١**

**ماسولکە** / masûlke/: ناو. ١. ماسۆڵـە؛ ماسـولکە؛ ماسـیلکە؛ مایچـە؛ مایچـە؛ ماسـوولە؛ ماسـلکە؛

مالوسکە؛ وەرسە؛ وەرسەلە؛ گردک؛ زیپەڕ؛ زەقلەک؛ جۆرێک شانەی لەشی گیانداران کە ئەندامان دەبزوێنێ ٢. ماسی بچووک ٣. شارەی چاڵ ٤. باریکەی سووری خەرمان کە هێشتا نەبۆتە کۆ ٥. ☜ **ماسۆڵە ـ١** ☰ ١. ماهیچە ٢. ماهی کوچک ٣. کاه کنار چالەی غلە ۴. باریکەی خرمن توده نشده ۵. ☜ **ماسۆڵە ـ١**

**ماسولکەژێ** / masûlkejê/: ناو. ڕەفیسکە؛ تاندون ☰ تاندون

**ماسولە** / masûle/: ناو. ماسوولکە؛ ماسۆڵە؛ بلبلیشک ☰ ماسولەی نساجی

**ماسە** / mase/: ناو. ڕەمڵ؛ مڵ؛ کفت؛ لم؛ کتلە؛ هوس؛ هۆسە؛ زیخ؛ خیز؛ قم؛ لیوە؛ لمب؛ چەوی ورد؛ دەنکی وردی لە کوارتز و وردەبەرد لە ئەندازەی ١ تا ٢ میلیمیتردا ☰ ماسە

**ماسەشۆری** / maseşorî/: ناو. ١. کار و ڕەوتی شۆردنەوەی ماسە لە قوڕ و لیتە ٢. شوێنێ ئەو کارەی تێدا دەکەن ☰ ١و٢. ماسەشویی

**ماسەنە** / masene/: چاوگ. پەنەماندن ☰ متورم کردن

**ماسەوا** / masewa/: ناو. دۆکلێوی بە ماست ☰ آش ماست

**ماسی**[1] / masî/: ناو. ١. ماسا؛ ماساو؛ ماسول؛ ماسۆ؛ مۆسە؛ ماساوی؛ ماهی؛ مای؛ مایی؛ دەستەیەک لە گیاندارانی ئاوژی ٢. سپیاتفرۆش؛ ماستفرۆش ☰ ١. ماهی ٢. لبنیاتفروش

⊡ **ماسی خاویار**: دەستەیەک ماسی بریتی لە ئوزونبرۆن، تاسماسی و فیلماسی کە گەراکەیان خاویارە و دەخورێ ☰ ماهی خاویار

**ماسی**[2]: ☜ **ماستاوی**

**ماسیان** / masyan/: ☜ **ماسین ـ١**

**ماسیبرەک** / masîb(i)řek/: ناو. ماسییەکە ددانی وەک هەرەیەکی و درێژە ☰ ارّەماهی

**ماسیبۆنکادۆ** / masîbonkado/: ناو. ماسی سپی کە خوێی پێوە دەکەن و قانگی دەدەن، ماوەیەکی زۆرتر دەمێنێتەوە و خراپ نابێ ☰ ماهی دودی

**ماسیپانک** / masîpanik/: ناو. جۆرێ ماسی ☰ ماهی سوف

**ماسیپەڕک** / masîpeř(i)k/: ناو. جۆرێ ماسی ☰ ماهی کفال

**ماسیچنە** / masîç(i)ne/: ناو. قوڵەشینە ☰ ماهی خورک

**ماسیخاتوونەک** / masîxatûnek/: ناو. جۆرێ ماسی ☰ نوعی ماهی قزلآلا

**ماسیخرک** / masîxirk/: ناو. وردیلە ماسی ☰ ماهی بسیار ریز

**ماسیخۆر** / masîxor/: ناو. دەریابرە؛ تۆرەمەیەک باڵندەی گەورە و دندووکتیژ، زۆرتر لە ئاوی ڕووندا دەژین ☰ غوّاص

**ماسیخۆرکە** / masîxorke/: ناو. باڵندەیەکە لە تۆرەمەی ماسیگرە، بە درێژایی نزیک ٣٥ سانتیمیتر، دندووک و لاقی سوورە، لە قەراغ دەریا، گۆلاوی شیرین، چۆماو، ئاوگر و گۆلاواندا دەبینرێت ☰ پرستوی دریایی

**ماسیخۆرە** / masîxore/: ناو. ماسیگرە؛ ماسیگرەک؛ ماسیگیرە؛ ماسیەوچنە؛ مایچنەک؛ قەلراو؛ قەلراوی؛ زیقاوە؛ زیقاوڵە؛ شاق؛ قووتان؛ ماساوگیر؛ واک؛ واقواق؛ نەورەس؛ پەلەوەرێکی گەورەی کەڕاویئاسایە بە پێی کورت، دندووکی چەماوە و جووچکی درێژەوە، ماسی دەخوا ☰ قاق؛ مُرغ ماهیخوار

**ماسیستێرک** / masîs(i)têrik/: ناو. جانەوەرێکی دەریاییە ☰ از جانوران آبزی

**ماسیسۆڵ** / masîsoł/: ناو. ماسی سۆڵوخوا؛ ماسی خوێ کراوی وشکەوە کراو ☰ ماهی شور

**ماسیسۆڵوخوا** / masî soł û x(i)wa/: ☜ **ماسی سۆڵ**

**ماسیفرۆش** / masîf(i)roş/: ناو. کەسێ کاری ماسی فرۆشتنە ☰ ماهیفروش

**ماسیفڕۆک** / masîfřok/: ناو. ماسیفڕەک؛ جۆرێ ماسی کە مرۆ لای وایە ئەفڕێ ☰ ماهی پرنده

**ماسیفڕەک** / masî f(i)řek/: ☜ **ماسیفڕۆك**

**ماسیڤان** / masîvan/: ☜ **ماسیگر**

**ماسی کارتووخک** / masîkartûxik/: ناو. سفرەماسی؛ جۆرێ ماسی بە لەشی پان و تەختەوە ☰ سُفرەماهی

**ماسیکەران** / masîkeran/: ناو. بێچووە بۆق ☰ بچه قورباغه

**ماسیگ** / masîg/: ناوەڵناو. پەڵماو؛ ماسیو؛ ماسیگ؛ هەلامساو؛ پەنەماو؛ ستووربوو ☰ آماسیده

**ماسیگر** / masîgir/: ناو. ماساوگیر؛ ماسیڤان؛ ماسیەوان؛ کەسێ کە ڕاوەماسی دەکا ☰ ماهیگیر

**ماسیگرە** / masîg(i)re/: ناو. ١. ماسیگرەک؛ ماسیگیرە؛ ماسیەوچنە؛ مایی‌چنەک؛ مایس‌چنەک؛ باڵندەی ڕەشەبا؛ تۆرەمە باڵندەیەکن، باڵیان درێژ و لاقیان بە پەردەیە، زیاتر بە پۆل دەگەڕێن، کۆچەرن، ماسیخۆرکەکانیش هەر لەم تۆرەمەیەن ٢. باڵندەیەکە لە تۆرەمەی ماسیگرە، پشتی بۆرە، شاباڵی ڕەشە و سەری باڵی سپی پنۆک پنۆکە، لاق و دندووکی باریک و زەردی ئاماڵ کەسکە، زستانان سەری ڕێ ـ ڕێ دەبێ، لە قەراخ دەریا، ئاودڕ و ئاوی زەوی و زاران دەبینرێن ☰ ١. پرستوی دریایی ٢. کاکایی نوک سبز

**ماسیگرەک** / masîg(i)rek/: ☜ **ماسیگرە ـ١**

**ماسیگیرە** / masîgîre/: ☜ **ماسیگرە ـ١**

**ماسیلکە** / masîlke/: ☜ **ماسولکە ـ١**

**ماسیلولو** / masîlûlû/: ناو. جۆرێ وردەماسی لە ڕووباردا کە دەیکەنە چێشتەی ماسی گرتن ☰ نوعی ماهی ریز که آن را طُعمه کنند

**ماسیلە** / masîle/: ناو. مارمێلکەی ناو خانوان کە لە جێگەی شێدار دەژی ☰ نوعی مارمولک

**ماسین** / masîn/: چاوگ. تێنەپەڕ. //ماسیت؛ دەماسی؛ بماسە// ١. ماسان؛ ماسیان؛ ماساییش؛ ماسایا؛ ماسایە؛ پەنەمین؛ پەنەمان ٢. مەیینی توێژی ڕۆن و چەوری بە سەر شتێکەوە ☰ ١. آماسیدن ٢. بسته شدن لایەی چربی بر چیزی

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ماسیو/ چاوگی نەرێنی: نەماسین

**ماسی نێزەدار** / masînêzedar/: ناو. جۆرێ ماسی قورتمدرێژ ☰ نیزەماهی

**ماسیو** / masîw/: ناوەڵناو. ماساو؛ پەنەماو؛ پەنمیاگ ☰ آماسیده

**ماسیەوچنە** / mas(i)yewç(i)ne/: ☜ **ماسیگرە ـ١**

**ماسیهوورک** / masîhûrik/: ناو. جۆرێ ماسی کە لە ناو قوتوو دەکرێ ☰ ماهی تُن

**ماسیهەڵچنە** / masîhełç(i)ne/: ناو. شاوە؛ شاهۆ ☰ حواصیل

**ماسیە پانکە** / masîye panke/: ناو. جۆرێ ماسی ☰ نوعی ماهی

**ماسیەخاتوونە** / masîye xatûne/: ناو. جۆرێ ماسی پنۆک ـ پنۆک ☰ نوعی ماهی خالدار

**ماسیەڕەشە** / masîyeřeşe/: ناو. ڕەشە ماسی ☰ نوعی ماهی سیاه رنگ

**ماسیەزەردە** / masîyezerde/: ناو. زەردەماسی؛ جۆرێ ماسی ☰ زردماهی

**ماسیەوان** / masîyewàn/: ☜ **ماسیگر**

**ماش** / maş/: ناو. ١. ماشە؛ شۆلک؛ گیایەکی یەکساڵانە، بە لاسکی ناسک و درێژ، گەڵای لاولای، گوڵی ئەرخەوانی و سپی و بەری باریک و درێژ و تیسکنەوە کە پاش گەیشتن، بۆر هەڵدەگەڕێ، هەروەها دەنکی خڕ و وردی ئەو

گیایە کە لە تاقمی دانەوێڵەیە ٢. تامانێکە دە سەری دۆلاشی دەگرن تا پووش و چیلکە نەگاتە زەنبوورە و بگەڕێتەوە ٣. بەرد یان چێوێ بۆ گل‌دانەوەی پووش‌وپلاش لە جۆگەدا ٤. ئاوی ڕاوەستاو ٥. ئەوەی بەر گەسک دێت ⇐ ١. ماش ٢. آبکش دهانەی ناو آسیا ٣. سنگ یا چوبی کە در مسیر آب می‌گذارند، خس و خاشاک را بگیرد ٤. آب راکد ٥. رُفتنی

⊡ **ماش کردن**: ١. زۆر هێنانی ئاوی کۆوەبوو بۆ ڕژان ٢. کۆ بوونەوەی پووش و چیلکە لە پشت ماشەوە ⇐ ١. فشار آوردن آب جمع شدە ٢. گرفتن و جمع شدن خس و خاشاک پشت آبکش آسیا

**ماشانن** / maşanin/: چاوگ. ١. گەزک دان؛ گەسک لێدان؛ جاروو کردن ٢. دەست گێڕان ⇐ ١. جارو کردن ٢. دست گرداندن

**ماشاو** / maşaw/: ناو. مروار؛ ئاومرواری؛ ئاوی‌سپی؛ ئەوئسبێ؛ ئەوێ ئسبێ؛ نەخۆشییەکە بەرچاو لێڵ دەکا ⇐ آب‌مروارید

**ماشایوە** / maşaywe/: چاوگ. کۆ کردنەوە؛ خڕ کردنەوە ⇐ جمع کردن

ـ **ماشت** / -maşt/: پاشەوشە. کاری ڕامالین ‹مال‌ماشت› ⇐ ـ روب

**ماشتن** / maştin/: چاوگ. گەسک دان ‹گا ڕاپەڕی زۆر لەگوڕ/ ماشتی قەسەلی ئاخوڕ «هەژار، بۆ کوردستان»› ⇐ جارو کردن

**ماشتنەوە** / mast(i)newe/: ☜ **ماشینەوە**

**ماشتەی** / maştey/: چاوگ. پەل هاویشتن؛ دەس بۆ کەسێ/ شتێ بردن ⇐ دست کشیدن

**ماشتەیوە** / maşteywe/: چاوگ. خڕ کردنەوە ⇐ جمع کردن

**ماشقە** / maşqe/: ناو. ماشکە؛ گراوی؛ دۆستی مێوینە (زۆرتر بۆ ماری دەڵێن) ⇐ معشوقە

**ماشک** / maşik/: ناو. ١. جۆرێ لووبیا ٢. چێشتەقولێ؛ چێشتی مندالان لە کایەدا ⇐ ١. لوبیای چشم بلبلی ٢. قاقا؛ دستپخت کودکان در بازی

**ماشکە** / maşke/: ☜ **ماشقە**

**ماشلێن** / maşlên/: ناو. ماشێن؛ چێشتی ماش ⇐ آش ماش

**ماش‌وبرنج** / maş û b(i)rinc/: ناوەڵناو. *[مەجازی]* سپی و ڕەش تێکەڵ (موو) ⇐ جوگندمی (مو)

**ماشۆت** / maşot/: ناو. ١. کلافە ئاوریشمی خۆڕست و دەستلێنەدراو ٢. گیاندارێکی پچووکە ملۆزمی نۆک و باقلەی سەوزە ⇐ ١. پیلەی ابریشم ٢. حشرەی آفت نخود و باقالی

**ماشوقە** / maşûqe/: ناو. جانانە؛ گراوی؛ یاری مێوینە ⇐ معشوقە

**ماشە** / maşe/: ناو. ١. سەبەتەیەکی دەم‌تەنگی بن‌فرەوانە ڕاوە ماسی پێ دەکەن ٢. پۆلووگر؛ پەنگر ٣. ماشەک؛ پەلەپیتکەی چەکی گەرم ‹ئامادەباشە دەس وە ڕووی ماشە/ یا ڕەسوولەڵلا وێت بۆ تەماشە! «حەسەن عومرانی»› ⇐ ١. سبد تلەماهی ٢. انبر ٣. ماشەی سلاح

**ماشەر** / maşer/: ناو. ماشەرە؛ کلافە بەنێکە لە نێوان دوو ئەژنۆدا هەڵدەکرێ ‹تای ماشەری ژین بە بێ وچان هەڵدەکرێ/ زانا ئەوە دڵخۆش دەژی بێ‌خەم دەمرێ «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ⇐ کلافی کە میان دو زانو پیچند

**ماشەرز** / maşerz/: ناو. گازی بزمار کێشانەوە ⇐ گازانبر؛ کلبتین

**ماشەرک** / maşerik/: ☜ **ماشەرە ـ٢**

**ماشەرە** / maşere/: ناو. ١. ☜ **ماشەر** ٢. ماشەرک؛ فرێت؛ تۆپەڵەبەنێ کە دە تەونەوە دەدرێ ٣. ئاورە؛ ئاگرە؛ جۆرێ کوانە دەم‌وچاو دەگرێ ⇐ ١. ☜ **ماشەر** ٢. پودی کە با دست لای تار گذارند ٣. آتش پارسی؛ نوعی دُمل

**ماشەرەبەن** / maşereben/: ناو. پەنگ؛ پەنک ⇐

کلاف ریس

**ماشەڕەش** / mașeřeș/: ناو. دانەوێڵەی ماش ☰ دانەی آشی ماش

**ماشەسپی** / mașes(i)pî/: ناو. ماشەسپیلکە؛ دانەوێڵەیەکە پانکەڵەو سپی و تامخۆش لە کەلوودا دەبێ ☰ لوبیا سفید

**ماشەسپیلکە** / mașes(i)pîlke/: ☜ **ماشەسپی**

**ماشەسۆرە** / mașesore/: ☜ **ماشەسورە**

**ماشەسورە** / mașesûre/: ناو. فاسۆلیا؛ لۆبیا؛ ماشەسۆرە ☰ لوبیا

**ماشەک** / mașek/: ☜ **ماشە ـ٣**

**ماشەڵ** / mașeł/: ناو. چەپەر لە بەر ڕووبار بۆ ماسی گرتن ☰ نوعی دام ماهیگیری

**ماشەلا** / mașela/: ☜ **ماشەڵلا**

**ماشەلان** / mașełan/: ناو. سروە بای خۆراوا ☰ نسیم غروب

**ماشەڵلا** / mașełła/: نزا. ماشەلا؛ لە چاوی پیس بە دوور بێ (تێبینی: واتای وشەبەوشەی دەبێتە: «هەرچی خودا بیەوێ» بەلام پتر بۆ پەسن دانی کەسێک بە کار دێ) ‹ماشەڵلا گەورە بووە!› ☰ ماشاءالله

**ماشی**[1] / mașî /: ناو. ڕەنگی کەسکی تۆخ لە ڕەنگی ماش ☰ رنگ ماشی

**ماشی**[2]: ئاوەڵناو. بە ڕەنگی کەسکی تۆخ ☰ ماشی رنگ

**ماشین**[1] / mașîn/: چاوگ. گسک دان و خاوێن کردنەوە ‹خستمانە دڵی مووساوە، کە: عاساکەت بهاوێژە. هەر لە جێوە هەموو جادووکارییەکانی ئەوانی ماشی و هەڵلووشی «هەژار، *قورئان*»› ☰ روبیدن؛ جارو کردن

**ماشین**[2]: ناو. ماشێن: ١. دەزگا؛ ماکینە؛ مەکینە؛ ئامێرێک لە چەن بەشدا کە بۆ ڕاگوێزان و گۆڕانی هێز، تەوژم و جوولە دروستکراوە ٢. هەر ئامرازێکی کارەبایی، میکانیکی یان ئیلکترونیکی بۆ جێبەجێ کردنی کارێک ٣. سەیارە؛ گەڕۆک؛ ئوتومبیل؛ ترومبیل ٤. مەکینە؛ ئامێرێک بۆ تاشین و کورت کردنەوەی مووی سەر و ڕیش ☰ ١و٢. ماشین ٣. خودرو؛ اتومبیل ۴. ریش‌تراش

**ماشینڕۆ** / mașînřo/: ئاوەڵناو. لەبار بۆ پێداڕۆشتنی ماشین ☰ ماشین‌رو

**ماشینشۆری** / mașînșorî/: ناو. کارواش ☰ کارواش

**ماشینەوە** / mașînewe/: چاوگ. تێپەڕ. //ماشیتەوە؛ دەماشییەوە؛ بماشەوە// ماشتنەوە: ١. کۆ کردنەوە ٢. /*پلار*/ خواردنی یەکجار زۆر و بە پەلە ‹هەرچی لە بان سفرەکە بوو یەکجێ ماشییەوە!› ☰ ١. جمع کردن ٢. زیاد و تند خوردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەماشینەوە

**ماشینی** / mașînî/: ئاوەڵناو. ماشێنی: ١. بەرهەمی ماشین ٢. وەک ماشین ☰ ١و٢. ماشینی

**ماشیو** / mașîw/: ناو. جۆگەی گەورە؛ شیوی بچووک ☰ جوی بزرگ

**ماشیەی** / mașyey/: چاوگ. بەرەو شتێک چوون؛ دەس بۆ شتێک/ کەسێ بردن ☰ یازیدن

**ماشێن** / mașên/: ناو. ١. ☜ **ماشین**[2] ٢. ☜ **ماشلێن**

**ماشێنەچی** / mașêneçî/: ناو. جلدروو؛ خەیات ☰ خیاط

**ماشێنی** / mașênî/: ☜ **ماشینی**

**ماشێوە** / mașêwe/: ناو. ڕاوک؛ پالوێنە؛ کفگیر ☰ کفگیر

**ماع** / ma'/: دەنگەناو. باع: ١. هاواری مەڕ و بزن ٢. هاواری گا و مانگا ☰ ١. بع ـ بع ٢. ماغ

**ماعبەین** / ma'beyn/: ☜ **مابەین**

**ماعبێن** / ma'bên/: ☜ **مابەین**

**ماعد** / ma'd/: ناو. ١. ڕەنگ و ڕوو ٢. واز؛ ئیشتیا ٣. /*کنایە*/ هەست و هەناو؛ بارودۆخی دەرونی

‹ماعدی خۆ تەنگ کەردش› ☰ ١. سیما ٢. اشـتها ٣. حالت درونی

**ماعده** / ma'de/: ناو. مەدە؛ میدە: ١. ورگ؛ ماعور ٢. ئیشتیا؛ واز ☰ ١. معده ٢. اشتها

**ماعزمه** / ma'zime/: ☜ **مالزەمە**

**ماعزمه** / ma'zeme/: ☜ **مالزەمە**

**ماعشلێر** / ma'ş(i)lêr/: ناو. ماعشـێل؛ شـەقەمێو؛ بنەڕەزی ئەستوور ☰ تنەی تاک

**ماعشێل** / ma'şêl/: ☜ **ماعشلێر**

**ماعمله** / ma'mile/: ☜ **مامەڵە**

**ماعمەله** / ma'mele/: ☜ **مامەڵە**

**ماعور** / ma'ur/: ناو. ماعده؛ مەدە؛ میـدە؛ ورگ ☰ معده

**ماف** / maf/: ناو. ١. کۆمەڵێک ئازادی و بەش کـە قانوون، عورف یـان سروشـت بـە کەسـێکی داوە ‹مافـی هەناسـە دان› ٢. ئـەو سەرپشـکییەی بـە هـۆی ئـەنجامدانی کارێکـەوە بـە کـەس یـان دامەزراوەیەک دەدرێ ‹مافـی خوێندن و نووسین› ☰ ١و٢. حق

▣ **مافی مرۆڤ** کۆمەڵێک ماف و ئازادی کـە هـەر کەسێک بە هـۆی مـرۆڤ بـوونی و بـێڕەچـاو کردنی بیر و بڕوا، نەتەوە، ڕەگەز، ڕەنگ، زمـان و ... دەتوانێ لێی بەهرەمەند بێ ☰ حقوق بشر

**مافپارێز** / mafparêz/: نـاو. وەکیـل؛ وەکـێل؛ پارێزەر ☰ وکیل

**مافخوراو** / mafxuraw/: ناوەڵـناو. زۆرلێکـراو؛ زوڵملێکراو ☰ مظلوم

**مافندی** / mafindî/: ☜ **مافنگی**

**مافنگی** / mafingî/: ناوەڵناو. مافندی: ١. بەشبڕاو؛ دەملەپووش ‹تەواو لە ماڵەکەی مافنگی کراوە!› ٢. هەژار؛ دەسبەتاڵ ٣. نابووت؛ تێشکاو ‹چە نـەماوە، مافنگی بووە!› ٤. مردال؛ مردەڵە؛ لەڕ و لاواز ☰ ١. بی‌نصیب ٢. مُفلس ٣. ورشکست ۴. مُفنگی

**مافور** / mafûr/: ☜ **مافورە**

**مافورە** / mafûre/: نـاو. مـافوور؛ مـافووێر؛ مـافیر؛ مـاهفوور؛ مـەحفوور؛ مـەحفویر؛ مـەحفووێر؛ مەحفیر؛ مەهفوور؛ مـەهووز؛ قاڵـی؛ ڕایـەخی بـە تەون تەنراوی پرزەدار ☰ فرش؛ قالی

**مافویر** / mafûyr/: ☜ **مافورە**

**مافه** / mafe/: ناو. دارێ کە بە دەرگـاوە دەنـدرێ بۆ داخستن ☰ کلون در

**مافەتا** / mafeta/: نـاو. مافەتە: ١. پەتا؛ درم؛ ئازار؛ دەردی گیرۆ ٢. گیابڕ؛ ئەو کرمەی کە ماڵات بـە گیاوە دەیخوا و دەردی تـێ دەکـەوێ ٣. *[کینایە]* مرۆی بە زەرەر و خراپ ☰ ١. بیماری واگیر ٢. کرم آفت دام که بر علف نشیند ٣. آدم موذی

**مافەتە** / mafete/: ☜ **مافەتا**

**مافەتـەدار** / mafetedar/: ناوەڵـناو. تـووش بـووی مافەتە ‹ماڵاتش سەرجەم وە دەرد ئەوگارەن/ هـەرد هەوارگەش مافەتەدارەن «مەولـەوی»› ☰ مبـتلا بـە بیماری واگیر

**مافیـا** / mafya/: نـاو. هـــەر ڕێخراوەیـــەکی خراپەکاری و تیروریستی شاراوە (بۆ یەکەم جار لە سەرەتاکانی چەرخی نۆزدەهەم لە دوورگەی سیسـیلی ئیتالیادا پێکهات) ☰ مافیا

**مافیر** / mafîr/: ☜ **مافورە**

**ماق** / maq/: ناوەڵـناو. ١. چاوزەق؛ چاوبۆق ٢. واق؛ حەپەساو ☰ ١. چشم برآمده ٢. خیره

▣ **ماق بردنەوە**: ☜ **ماق مان**

**ماق بوون**: چاو برینە شتێ/ کەسێ ‹مـاقی دوورە دەستان بوو، بانگم کرد، نەیبیست!› ☰ خیره شدن

**ماق مان**: ماق بردنەوە؛ حەپەسان؛ سەرسام بوون ‹لە کاری خودا ماق ماوم!› ☰ حیران شدن

**ماقنه** / maqine/: ناو. قرقرە؛ غەرغەرە؛ ماقڕنە ☰ قرقره

**ماقڕنه** / maqiřne/: ☜ **ماقنه**

**ماقۆڕ** / maqoř/: ناو. بەردی قووڵ کە ئاوی تێدا ڕادەوستێ ≡ سنگ گود کە آب باران در آن جمع شود

**ماقوور** / maqûr/: ☜ **ماقووڵ**

**ماقووڵ** / maqûł/: ناوەڵناو. ماقوور؛ مانقووڵ: ١. بەڕێز؛ بە حورمەت ‹پیاوێکی ماقووڵ و ڕدێن‌سپی› ٢. دڵپەسند ٣. سەنگین و گران ≡ ١. محترم ٢. مقبول ٣. متین

**ماک** / mak/: ناو. ماکە: ١. مادە؛ هەر ڕەگەز و بنچینەیێ کە شتی لێ پێکهاتووە؛ هۆی دروست بوون ‹ئەو کەسێکە هەموو شتی ـ بەوپەڕی ڕێکی و لەباری ـ درووس کرد و مرۆشی ـ لە سەرەتادا ـ لە ماکی قوڕ وەدی هێنا «هەژار، *قورئان*»› ٢. هێسن؛ تەنی سروشتی کە وێرای وزە، دیاردە و بوونەوەرەکانی جیهان پێک‌دێنێ ‹ئێوەی هەر لە تاقەکەسێک هێنایە دی و ژنەکەشی هەر لە ماکی ئەو دروس کرد «هەژار، *قورئان*»› ٣. دایک؛ داڵک؛ دادا ‹زا و ماک تێکەڵن› ٤. ئاسۆ؛ ئاسۆگ ٥. شاهەنگ؛ مێشەنگوینی مەلەکە ٦. کون و لانەی دڕندە و کێوێ ٧. ئەستوورایی جێگەی ئاوڵە کوتان ٨. زیپکەی ناو چاو بە هۆی ئاوڵەوە ٩. زەوی بەبڕشت ١٠. قۆبچە؛ بشکوژ؛ دوگمە ١١. جۆرێ مووروی بریقەدار ≡ ١و٢. مادە ٣. مادر ٤. افق ٥. ملکەی زنبورعسل ٦. لانە و کُنام حیوان درندە ٧. ورم جای آبلەکوبی ٨. جوش آبلە در چشم ٩. زمین حاصلخیز ١٠. دُکمە ١١. مُهرەی زینتی براق

▣ **ماکی سڕکەن**: ماکی هۆشبەر ≡ مادەی مخدر

**ماکارونی** / makarunî/: ناو. مەقەڕنە: ١. جۆرێ هەڕشتە لە ئاردی گەنم بۆ چێشتێکی ئیتالیایی بە ناوی سپاگێتی ٢. چێشتی سپاگێتی ≡ ١و٢. ماکارونی

**ماکاش** / makaş/: ناو. خێڵ؛ تایفە ≡ طائفە

**ماکاڤ** / makav/: ناو. ماکاو: ١. جۆگەی گەورە کە لە ئاوداشتندا جۆی تری لێ دەبێتەوە ٢. چەند دەستەکە دێڕاو پێکەوە ≡ ١. جوی اصلی در آبیاری ٢. چند دستە جوی کوچک در کشتزار

**ماکاو** / makaw/: ☜ **ماکاڤ**

**ماکبڕ** / makbiř/: ناو. کاری لە شیر گرتنەوەی بەرخ و کار ≡ عمل از شیر گرفتن برّە و بُزغالە

**ماکسی** / maksî/: ناو. جۆرێک کراسی داوێن‌درێژ ≡ ماکسی

**ماکۆ** / mako/: ناو. پاکۆ؛ بە سەر یەکا دراوی گیای دووراو ≡ علف یا غلەی دروشدەی انباشتە

**ماکوو** / makû/: ناو. مەکۆ؛ مەکوو؛ مەکووک؛ مەکووکە؛ مەکیک: ١. جێگەی ماسۆڵە لە ئامرازی جۆلاییدا ٢. میلەیەکە لە چەرخی درووماندا غەرغەرەی لە سەر دادەنرێ ≡ ١. مکوک جولایی ٢. ماکو

**ماکووز** / makûz/: ناو. گیایەکە لە ئاوا دەڕوێ لە کووزەڵە دەکا و ئاماڵ‌تاڵە ≡ گیاهی آبزی

**ماکە** / make/: ☜ **ماك**

**ماکەجۆ** / makeco/: ناو. شێلەگە؛ شەلیە؛ جێگەیەک لە جۆگە کە باریکەئاوێکی لێ جوێ دەبێتەوە ≡ بَرغ؛ جای بریدن از جوی اصلی

**ماکەر** / maker/: ناو. مێ‌کەر؛ دێڵەکەر ≡ مادەخر

**ماکەلە** / makele/: ☜ **مارەیی**

**ماکەو** / makew/: ناو. ماری؛ چێڵ؛ کەوی مێ ≡ کبک مادە

**ماکی** / makî/: سارستە. ئەدی کێ ≡ پس چە کسی

**ماکینە** / makîne/: ناو. مەکینە؛ ماشێن؛ ئامرازی دەسکرد بۆ کار هاسان کردنەوە ≡ ماشین

**ماکینەچی** / makîneçî/: ناو. ١. کەسێ کار بە ماکینە دەکا ٢. خەیات؛ جلدروو بە چەرخ ≡ ١. تکنیسین ٢. خیاط

**ماکێت** / makêt/: ناو. نموونەی بچووکتر لە ئەندازەی ئاسایی شتێ (وەک ماڵ) کە بە دەست

دروست دەکرێت ☰ ماکت

**ماگ** / mag/: ☚ ماو[1]

**ماگرت** / magirt/: ناو. مراری؛ مرواری؛ گەوهەرێکە لە ناو سەدەفدا ☰ مروارید

**ماگرتە** / magirte/: ناو. ١. پەڵـەی ڕەشـی ڕووی مانگ ٢. ☚ ماگیرسە ☰ ١. لکەهای روی مـاه ٢. ☚ ماگیرسە

**ماگە** / mage/: ئاوەڵناو. ١. باقیماو ٢. لە جـێ مـاو ☰ ١. باقی‌مانده ٢. برجای‌مانده

**ماگیرسە** / magîrse/: ناو. ماگرتـە؛ ڕەوتی مانـگ گیران ☰ خسوف

**مال** / mal/: ☚ ماڵ

⊡ **مال کەتن**: نـابووت بـوون؛ لـە مـاڵ و دارایـی بەش‌بران ☰ ورشکست شدن

**مالاخمە** / malaxme/: نـاو. خۆیـان؛ کلۆشـی گێرەکراوی خەرمان ☰ خرمن کوبیدەی بادنداده

**مالار** / malar/: نـاو. ١. سـێ‌پایـەی مەشـکە ٢. بنەماڵە؛ خێزانی مـاڵ ☰ ١. سەپایـەی مشـک ٢. خانواده

**مالاریا** / malarya/: ناو. نۆگە؛ ڕۆژنـاڕۆژە؛ نۆبـەتێ؛ پەتایەکی گەرمەسێران کە لە چـزی مێشـوولەی هۆدرە (ئانۆفێل) بەدی دێ و نەخۆش تووشی یاو و لەرز و عارەقی تاوتاوە دەکا ☰ مالاریا

**مالاڤا** / malava/: ☚ ماڵاوا

**مالاڤایی** / malavayî/: ☚ ماڵاوایی

**مالاکا** / malaka/: ئاوەڵناو. چـاوزەق؛ زەق‌تواشـا؛ چاودەرپەڕیو؛ چاوبەمۆڵەق؛ مولەقی چاو ☰ چشم برجسته

⊡ **مالاکا مەندش**: بە چاوی زەق ڕوانـین ☰ خیـره نگریستن

**مالامال** / malamal/: ئاوەڵـناو. دارمـاڵ؛ تـژە ☰ مالامال

**مالا من** / mala min/: سارستە. وشەیەکە لە جیاتی گیانەکەم ☰ جانا

**مالامیر** / malamîr/: نـاو. کۆشـکی خـان ☰ قصـر ارباب

**مالاهالی** / malahalî/: سارستە. جـا ئـەوە حاڵـە؛ ئەمەش بوو بە ژیان ☰ لفظ شکایت از روزگار

**مالبا** / malba/: نـاو. خەمـەگرۆ؛ سەرمازەڵـە؛ خومخمۆک ☰ آفتاب‌پرست

**مالباب** / malbab/: ناو. ماڵەباب؛ باوانی ☰ خانـەی پدری

**مالبات** / malbat/: ☚ ماڵبات

**مالتڤری** / maltivrî/: ناو. ئامرازێ لە ئاسیاودا کـە تەوەرە و بەرداشی سەرەوەی گرتووە ☰ ابزاری در آسیاب

**مالجو** / malco/: ناو. شەقەجۆ؛ جۆگەی سـەرەکی ☰ جوی اصلی

**مالچرا** / malç(i)ra/: نـاو. گرداپۆشـی چـرا؛ شیشەچرا ☰ شیشەی چراغ

**مالخراب**[1] / malx(i)rab/: ئاوەڵناو. مـاڵ‌خـەراب؛ ماڵ‌وێران ☰ خانەخراب؛ بیچاره

**مالخراب**[2]: سارستە. ماڵ‌خەراب؛ ماڵ‌کـاول (وشـەی سەرکۆنە کردن) ☰ خانەخراب (لفظ شماتت)

**مالخوێ** / malx(i)wê/: نـاو. مالخـێ: ١. خـاوەن‌مـاڵ؛ خانـەخوا ٢. بریکـار لـە خـەرج و مەزخاندندا ☰ ١. صاحب‌خانه ٢. وکیل خرج

**مالخەراب** / malxerab/: ☚ مالخراب

**مالخێ** / malxê/: ☚ مالخوێ

**مالزەمە** / malzeme/: نـاو. ماعزەمـە؛ ماعزەمـە؛ ئامێری کار ☰ ملزومات کار

**مالشەوتی** / malşewtî/: سارستە. مـاڵ‌سـووتاو؛ ماڵ‌کاول (وشەی سـەرکۆنە کردنـە) ☰ خانـەخـراب (لفظ شماتت)

**ماڵک** / malik/: نـاو. ١. مـالی کـەوان ٢. خـاوەن زەوی ٣. ئاغا؛ دەرەبەگ؛ خاوەن زەوی و زاری وا

کە چەن کرێکار و بنەماڵەی بە سەرەوە بێ ٤. خاوەن چەن چاوە ماڵ و دووکان کە بە کرێ درابن ٥. کەردی پچووک بۆ سەوزی چاندن ٦. کۆخ؛ کۆڵیت؛ کۆختە ٧. شەش‌گۆشەی ناو شانە هەنگوین ☰ ۱. فاصلەی دو سر کمان ۲. ارباب ۳و۴. مالک ۵. کرت کشاورزی ۶. کوخ؛ کُلبە ۷. هریک از شش‌ضلعی‌های کندوی عسل

**ماڵ‌کامباخ** / malkambax/: ئاوەڵناو. چارەڕەش؛ بێچارە؛ بەدبەخت ☰ بیچارە

**ماڵکەتی** / malketî/: ئاوەڵناو. نابووت؛ تێشکاو ☰ ورشکست

**مالکی** / malikî/: ناو. ۱. یەکێ لە چوار مەزهەبی بەناوبانگی موسوڵمانانی سوننی کە ئیمام مالکی کوڕی ئەنەس (٦٩-١٧٨ ک.م.) دایمەزراندووە ۲. هەرکام لە شوێنکەوتوانی ئەو مەزهەبە ☰ ۱و۲. مالکی

**مالم** / malim/: ☜ مالوم

**ماڵماشت** / malmaşt/: ناو. ۱. کەوشکەن؛ پێشخانە ۲. گەسک‌لێدەری ماڵ ☰ ۱. جای کفش در منزل ۲. جاروکش خانە

**ماڵماڵک** / malmalik/: ☜ ماڵماڵۆک

**ماڵماڵۆک** / malmalok/: ناو. ماڵماڵک؛ مارمێلکە ☰ سوسمار

**ماڵمیزک** / malmîzik/: ناو. میزەڵدان؛ گمێزدان ☰ مثانە؛ آبدان

**ماڵ‌نەکەتۆ** / malneketo/: نزا. نزایەکی باشە واتا: ماڵت نەڕمێ ☰ خانەات آباد (لفظ تحسین)

**ماڵنیش** / malnîş/: ئاوەڵناو. خانەنشین؛ گردەنشین؛ هەڵپەسێراو ☰ خانەنشین

**مالوسکە** / maluske/: ☜ ماسولکە ـ۱

**ماڵولکی** / malulkî/: ناو. شێوێکە لە هەویر و برۆێش چێ دەبێ ☰ آشی است

**مالوم** / malum/: ناو. مالم؛ پێشنوێژی جوولەکان ☰ روحانی یهود

**ماڵوێنچە** / malwênçe/: ☜ ملەگەوێ

**ماڵۆچ** / maloç/: ☜ ملەگەوێ

**ماڵۆچکە** / maloçke/: ناو. ماسوولکەی خەرمان ☰ باریکەی خرمن تودە نشدە

**ماڵۆچە** / maloçe/: ☜ ملەگەوێ

**ماڵۆس** / malos/: ناو. ماوی؛ ماهوو؛ مەهۆ؛ مێچکە بەراز ☰ خوک مادە

**ماڵۆسکە** / maloske/: ☜ ماڵوسکە

**ماڵوسکە** / malûske/: ناو. ماڵۆسکە: ۱. ماسوولکە؛ مایچە ۲. باریکەی سووری هێشتا کۆوەنەکراوی خەرمان ☰ ۱. ماهیچە ۲. باریکەی تودە نشدەی خرمن

**ماڵوگا** / malûga/: ئاوەڵناو. سەر زلتر لە ئاستی ئاسایی ☰ سر از حد طبیعی بزرگتر

**ماڵولک** / malûlik/: ناو. جانەوەرێکی خزۆکە ☰ از خزندگان

**مالوم** / malûm/: ئاوەڵناو. زاندراو؛ خویا «مالووم بۆ جە لای دووروەتەنانم/ بیلا جە گرۆی گڕ وەتەنانم «بێسارانی»» ☰ معلوم؛ مشخص

**ماڵەڤین** / malevîn/: ناو. ۱. دۆخی نابووت بوون؛ تێکشکان؛ هیچ بۆنەمان ۲. کەساسی؛ بێ‌بڕەوی ☰ ۱. ورشکستگی ۲. کسادی

**ماڵەوێچە** / maleweçe/: ☜ ملەگەوێ

**ماڵەوێنچە** / malewênçe/: ☜ ملەگەوێ

**ماڵهالو** / malhalû/: ☜ ماڵماڵەسوورە

**مالیتە** / malîte/: ناو. پەناگا؛ جێگەی خۆ لێ پەنادان ☰ پناهگاه

**مالیفەت** / malîfet/: ناو. کار و ڕەوتی ڕاهێنان؛ حاواندنەوە؛ بە خودی کردن ☰ تربیت

**مالینوس** / malînûs/: ناو. مانیلووس؛ دەرمانە سوورەی چاو ☰ داروی قرمز چشم‌درد

**مالیەز** / malyez/: ☜ مالێز

**مالێب** / maléb/: ☜ **ملهێب**

**مالێز** / maléz/: ناو. مالیەز؛ ڕیتکە؛ شلکینە؛ هەویری زۆر شل ☰ خمیر بسیار آبکی

**مالێڤ** / malév/: ☜ **ملهێب**

**مالێله** / malêle/: ☜ **مەلغە**

**ماڵ**[١] / mał/: ناو. مال: ١. خانوو؛ یانە؛ جێ‌ژیانی خێزان ‹دوژمن لە مالت ناهمێ بێ› ٢. دیو؛ ژوور ٣. شتی تایبەتی کەسێ ‹مالی خۆمە و نایفرۆشم› ٤. سامان؛ دەولەت و دارایی ‹بە مالی دنیا هەرگیز مەنازە/ گشت تەواو ئەبێ چ کۆن چ تازە «قانع»› ٥. کەلوپەلی بازرگانی وەک پارچە و قوماش ‹بازرگانێک هاتووە مالی هێناوە› ٦. *[شووره‌یی]* زێ؛ زێی حەیوانی مێچکە ٧. مابەینی هەر دووک سەری کەوان ٨. مابەینی دەندە و ئاموور ☰ ١. خانه؛ مسکن ٢. اتاق ٣. مال؛ دارایی ٤. ثروت ٥. کالای بازرگانی ۶. شرمگاه حیوان ماده ٧. فاصله‌ی دو سر کمان ٨. فاصله میان گاوآهن و خیش

▣ **مالی دنیا**: ١. دارایی ٢. *[کینایە]* هونەر و ژێهاتوویی ☰ ١. دارایی ٢. هنرمندی

⊡ **ماڵ بریان**: دز هاتن و مال بردن ☰ خانه را دزد زدن

**ماڵ برین**: دزی کردن ☰ دزدی کردن

**ماڵ بە قوڕ گیران**: *[کینایە]* مال کونا بوون؛ مال ڕمیان؛ مالوێران بوون ☰ خانەخراب شدن

**ماڵ پێکەوە نان**: کەلوپەل و پێویستی مال دابین کردن ☰ لوازم زندگی را فراهم کردن

**ماڵ خواردن**: *[کینایە]* بەش خواردن؛ تەپ دانە سەر بەشی دیتران ☰ مال خوردن

**ماڵ ڕمیان**: ☜ **ماڵ بە قوڕ گیران**

**ماڵ کردن**: ١. کەمێک بە لادا خوار کردنەوە ٢. مال کردنەوە؛ خانوو دروست کردن ٣. *[کینایە]* ژن هێنان و خێزان دامەزراندن ٤. جوێ بوونەوە لە مالی باب و سەربەخۆ بوون ‹مالە خۆی کردووە› ٥. کارێک لە کایەی تەختەنەرددا ☰ ١. مُتمایل کردن ٢. خانه ساختن ٣. مُتاهل شدن ۴. جدا شدن از خانه‌ی پدری و مُستقل شدن ۵. حرکتی در بازی نرد

**ماڵ کردنەوە**: ١. خانووبەرە دروست کردن ٢. *[کینایە]* زۆر و زیاد لە پێویست، شتێک سەندن و کۆ کردنەوە ‹ئەم هەمکە نانەت بۆ سەند؟ مال ئەکەیتەو؟!› ☰ ١. خانه ساختن ٢. انباشتن

**ماڵ کونا بوون**: ☜ **ماڵ بە قوڕ گیران**

**ماڵی کەسێ ئاوا بوون**: *[کینایە]* دەستەواژەیەک بۆ دەربڕینی سپاس و پێزانینی خۆ ‹ئەم هەموو زولمەی ڕەقیب کردی، لە ئاخر دولبەرم/ مالی ئاوا بێ، بە ماچێ لێوی تۆلەی کردەوە «حاجی قادر»› ☰ خانه‌ی کسی آباد بودن

**ماڵی کەسێ وێران/ کاول بوون**: *[کینایە]* دەستەواژەیەک بۆ دەربڕینی تووڕەیی و بەرهەلستی خۆ ‹یاخوا مالی ویران بێ وا مالوێرانی کردین!› ☰ خانه‌ی کسی خراب بودن

**- ماڵ**[٢]: پاشەوشە. مال: ١. پێداهێن ‹دەسمال› ٢. ڕامالێن ‹گەسکمال› ٣. ڕامال؛ خاوێن کردنەوە ‹بەفرمال› ٤. دروستکەر؛ بەر پێ دەر ‹نمەدمال؛ خشتمال› ٥. ساوێن ‹ڕۆنمال› ☰ ١و٢. ـ مال ٣. ـ روب ۴. ـ ساز ۵. ـ سا؛ ـ اندود

**مالات** / małat/: ناو. ئاژەل؛ پڕوپاتال؛ ولسات؛ حەیواناتی ڕاگرتن ☰ دام

**مالان**[١] / małan/: ☜ **مالین**

**مالان**[٢]: ناو. دانیشتوانی ئاوایی ☰ ساکنان آبادی

**مالانگەڕ** / małangeř/: ئاوەلناو. *[ڕپلار]* تایبەتمەندی کەس یان ئاژەلێک کە بۆ زکەتیری یان شتی تر سەر بە هەموو مالێکدا دەکا ‹تاژی تیر نەکرێ، مالانگەڕ دەبێ!› ☰ ولگرد

**مالانن** / małanin/: چاوگ. مالین ☰ مالیدن

**مالانە** / małane/: ناو. باجی خانوان ‹فێل و

فەرەجت بنێ بەو لاوە/ پارەی مالانەی مەلات نــەداوە «قانع»› ☰ باج مُستغلات

**مالاو / maław**/: ناو. ١. پاڕووکراو؛ گەسک‌لێدراو ٢. مشت‌ومال‌کراو ☰ ١. روبیده ٢. مالیده

**مالاوا**[1] / **maława**/: سارستە. مالاڤا: ١. وتەیەکە بـۆ سـەرکۆنە کـردنی تێکـەڵ بـە خۆشەویستی ٢. وتەیەکە بە واتای مالتان ئـاوەدان بـێ ☰ ١. لفظ شماتت محبت‌آمیز ٢. تعبیری به معنی خانه‌تان آباد

**مالاوا**[2]: نـزا. مالاڤـا؛ خوداحـافیز؛ خـاترێ‌وە ☰ خداحافظ؛ بدرود

**مالاوایی / maławayî**/: ناو. مالاڤایی؛ خواحافیزی؛ خاتر خواستن ☰ خداحافظی

**مالای / małay**/: چاوگ. مالین ☰ مالیدن

**مالایره / małayre**/: چاوگ. ڕامالین ☰ روبیدن

**مالبات / małbat**/: نـاو. مالبـات؛ خـاوخێزان؛ خانـەوادە ‹سـەد مالـبات لێـرە جـێگیر کـراون› ☰ خانواده؛ اهل خانه

**مالبراو / małb(i)raw**/: ☜ **مالدۆڕاو**

**مالبڕ / małbiř**/: ناو. ١. دیواربڕ؛ ئامرازی دەسـتی دزی مالان ٢. دزێ کە دیـوار کـون دەکـا ☰ ١. پشنگ؛ ابزار دیوار سوراخ کردن دزد ٢. دزد

**مالبڕی / małb(i)řî**/: ناو. کاری دزی لە مـالان ☰ دزدی خانه‌ها

**مالبشکن / małbişkin**/: ☜ **مالپشکن**

**مالبشکێن / małbişkên**/: ☜ **مالپشکن**

**مالبەفێرۆدەر / małbefêřoder**/: ناوەلـناو. دەس‌شاش ☰ ولخرج

**مالبەقوڕگیراو / małbequřgîraw**/: ☜ **مالوێران**

**مالبەکۆڵ / małbekoł**/: ناوەلـناو. /مەجاز/ ئـاوارە؛ بێ‌خانە و لانە ☰ آواره

**مالبەکۆڵەوە / małbekołewe**/: ناوەلـناو. /کینایە/ ڕەهەندە؛ ئاوارەی چۆلگەڕ ☰ خانەبدوش

**مالبەمال**[1] / **małbemał**/: نـاو. کـار و ڕەوتی گۆڕینەوەی کالا بە کالا ‹گەنم و نۆکمان مال‌بەمال کرد› ☰ تهاتُر؛ مُعامله‌ی پایاپای

**مالبەمال**[2]: ناوەلـکار. /کینایە/ گشـت مالـەکان ‹مال‌بەمال گەڕام› ☰ خانه‌به‌خانه

**مالبەن / małben**/: نـاو. میلەیـەک لـە نێـوان کەرستەی گواسـتنەوە (وەک گـاری و کالسـکە) و چاروادا بۆ ڕاکێشان ☰ مالبند

**مالبەند / małbend**/: ناو. ١. مەلبەند؛ نیشـتمان؛ جێ مال و ژیان؛ بنکەی مال ٢. تەختایی زین ☰ ١. موطن ٢. تخت زین

**مالپارێز / małparêz**/: ناوەلناو. ١. ڕژد؛ چکـووس؛ سـەقیل؛ قـرنیس ٢. /کینایە/ دەوڵـەمەندی ترسەنۆک ☰ ١. خسیس ٢. ثروتمند ترسو

**مالپارێزی / małparêzî**/: ناو. ڕژدی؛ چکووسی ☰ خسیسی

**مالپشکن / małpişkin**/: نـاو. مـال‌بشـکن؛ مال‌بشکێن؛ مـال‌پشـکێن: ١. کـاری گـەڕان لـە مـالان لـە دووی شـتێ ٢. کەسـێ کـە مـالان دەگەڕێ بـۆ دۆزینـەوەی شـتێ ☰ ١. جستجوی خانه‌ها ٢. مُفتش خانه‌ها

**مالپشکێن / małpişkên**/: ☜ **مالپشکن**

**مالپەرست / małperist**/: ناوەلـناو. مال‌خۆشەویست؛ دنیادۆس ‹چلکی دەسـتە مالـی دنیـا، وەک دەلـێن/ مـال‌پەرسـت پـەیمان‌شـکێنە و بێ‌بەلێن «هێمن»› ☰ دنیادوست

**مالپەڕ / małpeř**/: نـاو. سـایت؛ ناوەنـدێک بـە ناونیشانێکی تایبەتەوە لە ئینتەرنێتدا ☰ سایت

**مالتە / małte**/: سارستە. وشەیەکی سەرکۆنە کردنە ‹مالتە! بۆ هێندە تووڕەی؟› ☰ کلمه‌ی سرزنش

**مالتەرەی / małterey**/: چاوگ. ڕامالین ☰ رُفتن

**مالتەی / małtey**/: چاوگ. مالین ☰ مالیدن

**مالتەیره / małteyre**/: چاوگ. دامالین ☰ روبیدن

**مالخالو / malxalû/:** ☜ **مالماڵەسورە**

**ماڵخاڵــــو / małxałû/:** نـــاو. خاڵخاڵــــــۆكە؛ گوێرەكەسوورە ☳ كفشدوزك

**مالخـاون / małxawin/:** نـاو. مالـخۆ؛ خانـەخوێ؛ ماڵخوێ ☳ صاحبخانه

**مـاڵخوراو / małxuraw/:** ئاوەڵـناو. بـەشخـوراو؛ بەشخوریاگ ☳ مالباخته

**مالخۆ[١] / małxo/:** ناو. خـاوەنمـاڵ؛ خانـەخوێ ☳ صاحبخانه

**مالخۆ[٢]:** ئاوەڵناو. ١. خاوەن؛ خێو ٢. خۆماڵی ‹ماڵ لـە ماڵـخۆ حەرامـە؟! «مەسـەل»› ☳ ١. صـاحب ٢. خودی

**ماڵخۆشـــەویســـت / małxoşewîst/:** ئاوەڵـــــناو. ماڵپەرست؛ دنیادۆس ☳ دنیادوست

**مالدار / małdar/:** ناو. ١. دەوڵەمەند ٢. ئاژەڵـدار ☳ ١. ثروتمند ٢. دامدار

**مالـــداری / małdarî/:** نـــاو. ١. گردەوەكـــۆیی ٢. كەیوانوویی؛ ئاگاداری لە ماڵ ‹هونـەری ماڵـداری› ٣. ئاژەڵـداری ☳ ١. صـرفەجـویی ٢. خانـەداری ٣. دامداری

**مـــاڵدۆراو / małdořaw/:** ئاوەڵـناو. مــــاڵبـــراو؛ ماڵلەخەسار؛ ئەوەی بە تەڵەكە یان زۆر ماڵی لـە دەست دەرهاتبێ ☳ مالباخته

**ماڵدۆســـت / małdost/:** ئاوەڵـــناو. ماڵـــــپارێز؛ ماڵخوەشەویس ☳ مالدوست

**مالران / małran/:** چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //ماڵـرای؛ دەماڵرێ؛ بماڵـرێ// ماڵـێوران؛ ماڵـیان؛ گەسـك دران ☳ روبیده شدن

■ ئاوەڵـناوی بـەركاری: ماڵـراو/ چـاوگی نـەرێنی: نەماڵران

**مـاڵراو / małraw/:** ئاوەڵناو. ماڵـیاو؛ ماڵـێوراو: ١. خاوێنەوەكراو؛ گەسـك دراو ٢. پێداسـاویاو ☳ ١. روبیده و تمیز شده ٢. سایيده شده

**ماڵستن / małistin/:** چاوگ. ڕەنگ كردن؛ نەخش كردن ☳ رنگ كردن

**ماڵسواری / małs(i)warî/:** ناو. یەكسم؛ چوارپـەلی بۆ سوار بوون ☳ مالسواری

**مالشت / małişt/:** ناو. ١. داماڵین؛ كاری بە تەوژم دەس بـە لەشـدا هێنـان ٢. كـاری خـاوێن كردنـەوەی وڵات ٣. كـاری بریقـەدار كـردنی شتێك ☳ ١. ماساژ؛ مالش ٢. رُفت‌ورُب ٣. صیقل

**مالشتدەر / małiştder/:** ☜ **مالشته[١]ـ١**

**مالشتن / małiştin/:** چـاوگ. ماڵشـت كـردن ☳ صیقل دادن

**مالشته[١] / małişte/:** ناو. ١. ماڵشتدەر؛ كەسێ كە مشتوماڵ دەدا ٢. خاوێنكار ☳ ١. ماسـاژدهنده ٢. نظافتچی

**مالشته[٢]:** ئاوەڵناو. بریقەدەر ☳ صیقلدهنده

**ماڵفرۆش / małf(i)roş/:** ناو. بازرگـان؛ بـازاڕوان؛ سەوداگەر؛ مامەڵەچی؛ تاجر ☳ بازرگان

**مالك / małik/:** نـاو. ١. خانه ـخانەی چوارسـووچ ٢. بەیتی شێعر ☳ ١. جدول مربعات ٢. بیت شعر

**ماڵكـاول[١] / małkawil/:** ئاوەڵـناو. مـــاڵوێـران ☳ خانەخراب

**ماڵكاول[٢]:** سارسته. وشەیەكە بـۆ لۆمـە و سـەركۆنە كردن ☳ كلمەی سرزنش

**مـالكۆ / małko/:** نـاو. دەسـكی دۆڵ؛ دەســكی دینگـی چەڵـتووك كوتـان ☳ دسـتەی دنـگ شالیكوبی

**مـالگر[١] / małgir/:** نـاو. كرێنشـین؛ كرانشـین ☳ اجارەنشین

**مالگر[٢]:** ئاوەڵناو. ماڵگرەوە؛ تایبەتمەندی كەسێ كە شتێ دەشارێتەوە بۆ گران بوون ☳ مُحتكر

**مالگرەوە / małg(i)rewe/:** ☜ **مالگر[٢]**

**مالگه / małge/:** ناو. خانووی كۆچەر لە ئاوایی كە تەنیا زستان تیا دەژی ☳ خانەی ایلاتـی در آبـادی

که فقط زمستان در آن زندگی کنند

**ماڵلەخەسار** / małlexesar/: ☜ **ماڵدۆڕاو**

**ماڵلەیەک** / małleyek/: ئاوەڵناو. ئێکماڵ؛ شەریک؛ برابەش ‹لەگەڵ کاکم ماڵلەیەکین› ☰ شریک در دارایی

**ماڵماڵ**[1] / małmał/: ناو. ١. کەسێ کە گەسک لە ژووری ماڵ ئەدا ٢. ☜ **ماڵماڵانێ** ☰ ١. جاروکش خانه ٢. ☜ **ماڵماڵانێ**

**ماڵماڵ**[2]: ئاوەڵناو. ماڵ بە ماڵ ‹گەڕانی ماڵماڵ› ☰ خانه به خانه

**ماڵماڵ**[3]: ئاوەڵکار. ١. تاقەتاقەی ماڵان ‹ماڵماڵ نەبێ هەمووی چووین› ٢. هەموو خانووەکان ‹ماڵماڵ گەڕان› ☰ ١. تک تک خانه‌ها ٢. خانه به خانه

**ماڵماڵانێ** / małmałanê/: ناو. ماڵماڵ؛ کایەی خانووچکە دروست کردنی زارۆکان ☰ بازی خانه‌سازی کودکان

**ماڵماڵە** / małmałe/: ناو. تاک‌تاکەی ماڵان ☰ تک و توک خانه‌ها

**ماڵماڵەسوورە** / małmałesûre/: ناو. ماڵهالوو؛ خاڵخاڵۆکە؛ مامالەسوورێ؛ ماماڵە؛ مامەلەسوورە؛ مامەلێ؛ مامەلە؛ ماڵخالوو؛ گوێرەکەسوورە ☰ کفشدوزک

**ماڵمەردمخۆر** / małmerdimxor/: ئاوەڵناو. هۆگر و دەمەچەشتەی ماڵی خەڵک ☰ مال‌مردم‌خور

**ماڵمیرات**[1] / małmîrat/: ئاوەڵناو. ماڵ بە میرات چوو ☰ ثروت به جا گذاشته

**ماڵمیرات**[2]: سارستە. وشەی سەرکۆنە؛ ماڵکاول ☰ کلمه‌ی سرزنش

**ماڵنج** / małinc/: ناو. ئامرازی لووس کردنی سواغ ☰ ماله‌ی بنایی

**ماڵنووستنان** / małnûstinan/: ناو. کاتی خەوتنی خەڵکی دێ و کوژانەوەی چراکانیان ‹ماڵنووستنان هەر دوو باڵم دەکەمەوە/ لە چوار لاوە زام بانگ دەکەم/ بێ بسرەوێ «پەشێو»› ☰ خواب هنگام

**ماڵوبڕ** / mał û biř/: ناو. ١. کاری ماڵەوماڵ کۆ کردنەوەی قەڵتەدار بۆ سووتاندن ‹با ماڵوبڕ بکەین بۆ مزگەوت› ٢. ماڵوڕ؛ کاری ڕوون کردنەوەی جیازی بووک پێش لە مارە بڕین ☰ ١. عمل جمع کردن هیزم از خانه‌ها برای سوخت ٢. احصاء جهیزیه پیش از عقد

▣ **ماڵوبڕ کردن**: ماڵوڕ کردن؛ دیاری کردنی جیازی بووک ☰ تعیین کردن جهیزیه‌ی عروس پیش از عقد

**ماڵوپەز** / mał û pez/: ناو. وڵسات؛ مەڕ و ماڵات ☰ احشام و اغنام

**ماڵوپیاو** / mał û p(i)yaw/: ناو. لە هەر ماڵەی پیاوێ بۆ زبارە ☰ از هر خانه‌ای مردی برای کار گروهی

**ماڵوحاڵ** / mał û ĥał/: ناو. *[کینایە]* ١. جۆری گوزەران ٢. کەلوپەلی ماڵ ☰ ١. نوع زندگی ٢. اثاث خانه

**ماڵوڕ** / małwiř/: ☜ **ماڵوبڕ-٢**

**ماڵوسامان** / mał û saman/: ناو. ماڵ و دارایی؛ کەیە و کولفەت ‹ماڵوسامان، کۆتی پامان «مەسەل»› ☰ مال و منال

**ماڵومناڵ** / mał û m(i)nał/: ☜ **ماڵومنداڵ**

**ماڵومنداڵ** / mał û mindał/: ناو. ماڵومناڵ؛ خاوخێزان ☰ خانواده

**ماڵوێران**[1] / małwêran/: ئاوەڵناو. ماڵبەقوڕگیراو؛ لێقەوماو؛ زۆر زیان لێکەوتوو ☰ خانه‌خراب

**ماڵوێران**[2]: سارستە. ماڵبەقوڕگیراو؛ وشەی سەرکۆنە؛ ماڵکاول ☰ کلمه‌ی سرزنش

**ماڵۆچکە** / małoçke/: ناو. ماڵۆچە؛ ماڵی گچکە ☰ خانه‌ی کوچک

**ماڵۆچە** / małoçe/: ☜ **ماڵۆچکە**

**ماڵۆکەن** / małokan/: ☜ **ماڵەوکەن**

**ماڵوو** / małû/: ناو. مەهلی؛ خێشک ☗ مالەی شخم صاف کن

**ماڵووکێش** / małûkêş/: ناو. داری نێوان خێشک و نیر ☗ چوب میان ماله و یوغ

**ماڵە** / małe/: ناو. ١. ماڵەسواخ؛ ئامرازی قوڕ لووس کردن ٢. خێشک؛ تەختەی ڕێک و لووس کردنی شیوەرد ٣. پەڵەپەڵەی دەم و چاوی ژنی ئاوس ٤. فلچەی زبری جۆلا کە چرێشی پێ لە بووزوو دەدا ☗ ١. مالەی بنایی ٢. هبد؛ مالەی صاف کردن شُخم ٣. ماهه؛ لکەهای صورت زن آبستن ۴. فرچەی بافنده

⊡ **ماڵە دان**: خێشک کێشان؛ ساف کردنی جووت بە ماڵە ☗ صاف کردن شخم

**ماڵە کردن**: ☜ **ماڵە کێشان**

**ماڵە کێشان**: ماڵە کردن؛ لووس کردنی قوڕ بە ماڵە ☗ ماله کشیدن

**ماڵەباب** / małebab/: ناو. بابان؛ باوان ☗ خانە و سامان پدری

**ماڵەباقی** / małebaqî/: نزا. ئای خۆزگە؛ بریا ☗ ای کاش

**ماڵەپیتان** / małepîtan/: ☜ **ماڵەپیتێن**

**ماڵەپیتکان** / małepîtkan/: ☜ **ماڵەپیتێن**

**ماڵەپیتێن** / małepîtên/: ناو. ماڵەپیتان؛ ماڵەپیتکان؛ گەمەیەکی زارۆکانە بە چەو دەیکەن ☗ نوعی شن‌بازی کودکان

**ماڵەجندە** / małecinde/: ☜ **جندەخانە**

**ماڵەزا** / małeza/: ناو. خوشکەزا ☗ خواهرزاده

**ماڵەژێر** / małejêr/: ناو. ڕەزبەر؛ کەوچەرین؛ مانگی سەرەتای پاییز ☗ مهرماه

**ماڵەسواخ** / małes(i)wax/: ☜ **ماڵە ـ١**

**ماڵەغان** / małeğan/: ناو. مەراخان؛ مەرخان؛ مەرەخان؛ مەڵەخان؛ مەڵەغان؛ کەرەمتوو؛ کەلەندی؛ کێلەندی؛ قرم؛ قڕم؛ داسێکی درێژە بە پێوە دروێنەی پێ دەکەن ☗ داس بلند لبە پهنی که ایستاده به کار می‌برند

**ماڵەغانگێر** / małeğangêr/: ناو. کەرەمتووکێش؛ کەسێک کە بە مەڵەغان گیا دەدوورێت ☗ دروگر با داس بزرگ

**ماڵەفە** / małefe/: ناو. ١. کاری بە دەست خاوێن کردنەوە ٢. کاری مشتومال دان و بریقە لێ خستن ☗ ١. عملِ با دست زدودن ٢. صیقل‌کاری

**ماڵەکاری** / małekarî/: ناو. کاری قوڕ بە ماڵە سواغ دان ☗ ماله‌کشی

**ماڵەکۆڵە** / małekołe/: ناو. ١. ماڵۆچکە؛ ماڵی چکۆلە ٢. ماڵی بێ‌پێت و گاڵتەجاڕ ‹ماڵ بکەرەوە، ماڵەکۆڵە مەکەرەوە «مەسەل»› ☗ ١. خانەی کوچک ٢. خانەی اسباب‌بازی

**ماڵەکینە** / małekîne/: ناو. چوارگۆشە؛ چوارسووچ ☗ مُربع

**ماڵەکێش** / małekêş/: ناو. کەسێک کە لە قوڕەکاریدا بە ماڵە قوڕەکە تێ‌هەڵدەساوێ ☗ ماله‌کش

**ماڵەگەورە** / małegewre/: ناو. بەرەماڵ؛ بنەماڵە؛ جاماڵ ☗ خاندان

**ماڵەوکەن** / małewken/: ناو. ماڵۆکەن؛ دیواربڕی دز ☗ پشنگ؛ ابزار دیواربُری دزدان

**ماڵەوماڵ**[1] / małewmał/: ئاوەڵناو. ماڵ‌بەماڵ ‹سەردانی ماڵەوماڵ› ☗ خانه به خانه

**ماڵەوماڵ**[2]: ئاوەڵکار. ئەم ماڵ و ئەو ماڵ ‹ماڵەوماڵ گەڕام نەتمدیتەوە› ☗ خانه به خانه

⊡ **ماڵەوماڵ کردن**: لە خانوویێکەوە بۆ خانوویێ‌تر ڕۆیشتن ‹بەس ماڵەوماڵ بکە!› ☗ از خانه‌ای به خانه‌ای رفتن

**ماڵەوە** / małewe/: ناو. ١. ماڵ؛ جێگەی ژیانی

خێزان ٢. [کینایە] کەیوانوو ‹ماڵەوە چ دەڵێ؟› ٣. [کینایە] ژن و منداڵان ‹ماڵەوە چۆنن؟› ١. مسکن ٢. همسر ٣. زن و فرزندان

**ماڵەهەنگ / małeheng/**: ناو. شانە هەنگوین شانەی عسل

**ماڵی / mału/**: ئاوەڵناو. ١. کەوی؛ کەدی؛ حەمایەت ٢. تایبەتی ماڵ ‹نان ماڵی› ١. رام؛ اهلی ٢. خانگی

◻ **ماڵی کردن**: کەوی کردنی ئاژەڵی کێوی رام کردن حیوان وحشی

**ماڵیات / małyat/**: ناو. ١. پیتاک؛ بەرج؛ خەراج؛ خاراج؛ خووە؛ خووک؛ خوویک؛ مەکات؛ پارەیێ کە دەوڵەت بە گوێرەی قانوون لە خاوەنماڵانی دەستێنێ و لە حیسابی داهاتە گشتییەکانی دەخا ٢. ماڵات؛ مەڕوماڵات ١. مالیات ٢. دام

**ماڵیان / małyan/**: ☜ ماڵران

**ماڵیاو / małyaw/**: ☜ ماڵراو

**ماڵین / małîn/**: چاوگ. تێپەڕ. //ماڵیت؛ دەماڵی؛ بماڵە// ماڵان: ١. لێ دان ‹کوتەکێکی ماڵی بە پشتیا› ٢. ساوین ‹ڕۆنی پێدا بماڵە!› ٣. بەر پێ دانی بەرگن بۆ لباد ٤. گەسک و پارۆ لێ دان ‹نە کای بۆ بێنە، نە جێی بماڵە/ هیچ ئەرکیان نییە ئەو دوو گەماڵە «قانع»› ١. زدن ٢. ساییدن ٣. نمد مالیدن ۴. روبیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەماڵین

**ماڵینەوە / małînewe/**: چاوگ. تێپەڕ. //ماڵیتەوە؛ دەماڵییەوە؛ بماڵەوە// ١. بردنی هەموو شتێک ٢. دیسانەوە خاوێن کردنەوە بە گەسک و بێڵ ٣. سڕینەوە و بریقە لێ خستنی شت ١. چپاول کردن ٢. باز جارو زدن ٣. زدودن و صیقل دادن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەماڵینەوە

**ماڵیەی / małyey/**: چاوگ. ماڵران روبیده شدن

**ماڵیەیرە / małyeyre/**: چاوگ. داماڵران زدوده شدن

**ماڵێوران / małêwran/**: ☜ ماڵران

**ماڵێوراو / małêwraw/**: ☜ ماڵراو

**مام / mam/**: ناو. ئاپ؛ مامە عمو

**ماما / mama/**: ناو. ١. دایکی دایک و باب ٢. ☜ مامان ١. مادربزرگ ٢. ☜ مامان

**ماماران / mamaran/**: ناو. جۆرێ خەمەگرۆ کە دوور لە ئاو لە چیا هەیە و زۆر زلە نوعی سوسمار درشت

**مامازیان / mamaz(i)yan/**: ناو. شنگڵەبەرەکەتەی مازوو مازوج دوقلو

**مامالەسوورێ / mamalesûrê/**: ☜ ماڵماڵەسوورە

**مامالەگێجێ / mamalegêcê/**: ناو. مامانەگێجێ؛ مامەسوورە؛ باوەخولێ؛ دایەخولێ باوەخولێ بازی چرخ زدن

**ماماڵە / mamałe/**: ☜ ماڵماڵەسوورە

**مامان / maman/**: ناو. ماما؛ ماموو؛ ماموون؛ مامەچە؛ تایەن؛ ئاریکاری دایک لە زاندا ‹مامان کە زۆر بوو منال پێچ دەخوا «مەسەل»› ماما؛ پازاج

**مامانەگێجێ / mamanegêcê/**: ☜ مامالەگێجێ

**مامانی / mamanî/**: ناو. ماموونی: ١. کاری مامان ٢. کرێی مامان ١. شُغل مامایی ٢. مُزد ماما

**مامبرایمە / mamb(i)rayme/**: ناو. جۆرێ ترێ نوعی انگور

**مامبز / mambiz/**: ☜ مامزـ١

**مامجەژنە / mamcejne/**: ناو. گیایەکە گیاهی است

**مامجێژنۆکە / mamcêjnoke/**: ناو. گیایەکی گوڵ سپییە لە نێو نۆک و شێوەردا شین دەبێ گیاهی است

**مامر / mamir/**: ناو. کەرکی؛ مریشک مُرغ خانگی

**مامراوی / mam(i)rawî/**: ناو. مێوە مراوی

مُرغابی ماده

**مامرک** / mamirk/: ناو. بارۆکـــه؛ وارۆک ▤ جوجه‌مُرغ ماده

**مامرەشامی** / mam(i)reşamî/: ناو. قەلەموونـــە؛ بۆقلە؛ عەلەشیش؛ قەل ▤ بوقلمون

**مامرکێویلە** / mam(i)rekêwîle/: ناو. مەلێکـە لـە کەلەشێر دەکا ▤ پرندەای شبیه خروس

**مامڕێواس** / mamřêwas/: ناو. گیایـەکی بلـندی گـەلادرێژی ترشـی دەرمـانی کرمـە ▤ گیـاهی دارویی

**مامز** / mamiz/: ناو. ١. مامبز؛ ئاسـک؛ کـەژاڵ ٢. ماسییەک کە گەرا دادەنـێ ٣. ☜ مـامزە ▤ ١. آهو ٢. ماهی مادر ٣. ☜ مامزە

**مامزە** / mamze/: ناو. مـامز؛ مـەهمێز؛ میهمـۆز؛ ئاسنێکە لە پاش پانیـەی چەکمـە قـایم دەکـرێ نووکی تیژی هەیە لە تەڕادی ئەسـپ دەدرێ بـۆ لێخوڕین ▤ مهمیز

**مامسارمە** / mamsarme/: ناو. جـۆرێ هـەمرۆ ▤ نوعی گلابی

**مامش** / mamiş/: ئاوەڵناو. بێدەنگ؛ کـڕ؛ مـات ▤ خاموش؛ بی‌صدا

**مامشاخانە** / mam(i)şaxane/: نـــاو. [کینایـــە] ئاودەست؛ دەساو ▤ مُستراح

**مامشەبەقە** / mamşebeqe/: ناو. کـاری دووریـنی دوو تەختە بـەرماڵ یـان جـاجم پێکـەوە ▤ کـار دوختن دو تخته سجاده یا جاجم به هم

**مامک** / mamik/: ناو. مەتەڵـۆکە؛ دەناچییـە ▤ چیستان

**ماملەقووچە** / mamleqûçe/: ناو. کـڵاوی سـەر قووچی شەوانە ▤ شبکُلاه بلند

**مامڵە** / mamiłe/: ☜ مامەڵە

**مامڵەپەشیمانی** / mamiłepeşîmanî/: ☜ مامەڵەپەشیمانی

**مامناونج** / mamnawinc/: ناو. ناوگین؛ مامناوەنـد ▤ میانی

**مامناونجی** / mamnawincî/: ☜ مامناوەندی

**مامناوندی** / mamnawindî/: ☜ مامناوەندی

**مامناوەند** / mamnawend/: ناو. ناڤـنج؛ نـاوگ؛ ناوگین ▤ میانی

**مامناوەندی** / mamnawendî/: ئاوەڵناو. مامناوندی؛ مامناونجی؛ بـەینی زل و بچـووک؛ بـەینی زۆر و کەم ‹بالای مامناوەندی› ▤ متوسط

**مامور** / mamur/: ناو. گاڵـتەجاڕ؛ دڵخۆشـکەرەی ئاپۆرە ▤ دلقک

**ماموسا** / mamusa/: ☜ مامۆستا

**مامۆ** / mamo/: ناو. ئاپۆ؛ ئاپ ▤ عمو

**مامۆتک** / mamotik/: ئاوەڵناو. زۆر عـاقڵ و زانـا ▤ بسیار دانا

**مامۆزا** / mamoza/: ☜ ئامۆزا

**مامۆژن** / mamojin/: ناو. ئامۆژن؛ مەمۆژن؛ ژن‌مام؛ ژن‌ئاپ ▤ زن‌عمو

**مامۆسا** / mamosa/: ☜ مامۆستا

**مامۆستا**[1] / mamosta/: ناو. مامۆسا؛ ماموسا؛ وسـا: ١. زانیار و لێزانی فێرکار ٢. دەرسبێژ؛ موعـەلیم؛ ئەو کەسـە کـاری دەرس وتنـەوە و ڕاهێنانـە ٣. ئوسـتاد؛ خـاوەن بـانترین پلـەی فێرکـاری لـە زانستگادا ٤. مەلای ئایینی ▤ ١. اُستاد ٢. مُعلم ٣. اُستاد دانشگاه ۴. مُلا

**مامۆستا**[2]: ئاوەڵناو. مامۆسا؛ ماموسا؛ پسـپۆڕ؛ لێـزان؛ سەردەرچوو ▤ اُستاد

**مامو** / mamû/: ☜ مامان

**ماموت** / mamût/: ناو. ئەو فیلانەی لـە سـەرەتای دەورانی چوارەمی زەوی‌ناسـیدا ژیـاون و لەشـی زۆر گـەورە و تـووکن و عـاجی درێـژ و لوولیـان هەبووە ▤ ماموت

**ماموتە** / mamûte/: ناو. ١. خوشیلک ٢. شـیری

خوشیلک 🇮🇷 ١. گیاهی است ٢. شیرەی گیاهی است

**مامون** / mamûn/: ☜ **مامان**

**مامونی** / mamûnî/: ☜ **مامانی**

**مامونیە** / mamûn(i)ye/: ناو. شێوی ئاردی بۆدراو بە ڕۆنەوە 🇮🇷 آش آرد بوداده با روغن

**مامە** / mame/: ناو. مام؛ مامۆ؛ ئاپ؛ بـرای بـاب 🇮🇷 عمو

**مامەچە** / mameçe/: ☜ **مامان**

**مامەحوجی** / mameĥucî/: ناو. *[کنایە]* پـارووی زل 🇮🇷 لقمەی بزرگ

**مامەحووچێ** / mameĥûçê/: ناو. *[پلار]* لۆت؛ لۆتە؛ پارووی زل 🇮🇷 لُقمەی بزرگ

**مامەخۆڵینە** / mamexołîne/: ناو. پووراپشـۆکە 🇮🇷 حشرەی خرخاکی

**مامـەخـەمـە** / mamexeme/: نـاو. خـەمان؛ خاڵەخەمە؛ کەسێ دە خەمی هەموو کەسدایە 🇮🇷 سنگ صبور

**مامەسورە** / mamesûre/: ☜ **مامالەگێجێ**

**مامەلە** / mamele/: ☜ **ماڵماڵەسورە**

**مامـەلینچک** / mamelînçik/: نـاو. براتووتـە 🇮🇷 انگشت بُنصُر

**مامەلێ** / mamelê/: ☜ **ماڵماڵەسورە**

**مامەڵە** / mameɫe/: ناو. مامڵە؛ ماعملە؛ ماعمەلـە؛ ساردوسەودا؛ کاری کڕین و فرۆشـتن ‹مامەلـەی ئاسان، خەڵاتی ڕاسان «مەسەل»› 🇮🇷 مُعامله

**مامـەڵەپەشـیمانی** / mameɫepeşîmanî/: نـاو. مامڵەپەشیمانی؛ کەرانە؛ تاوانێ کـە پـەژیوان لـە سەودا دەیدا 🇮🇷 تاوان پشیمانی از معامله

**مامەڵـەچی** / mameɫeçî/: نـاو. بازرگـان؛ تـاجر؛ بازاڕوان 🇮🇷 بازرگان

**مامەڵەسورە** / mameɫesûre/: ☜ **ماڵماڵەسورە**

**مـامیران** / mamîran/: نـاو. مـامیلان؛ پەنجـەدال؛ گوڵەئاران؛ ئالفەگیایەکی پایایە بە گەڵای سەوزی کاڵ، گوڵی زەردی هێشوویی چەترئاسا و میوەی باریک و درێژەوە کە هەموو ئەندامانی شیلەیەکی نارنجی ژەهراوییان هەیە 🇮🇷 مامیران

**مامیلان** / mamîlan/: ☜ **مامیران**

**مـان**[1] / man/: چـاوگ. تێنەپـەڕ. //مـای؛ دەمـێنی؛ بمێنە// ١.ماین؛ مانەوە؛ مەنن؛ مەنای؛ درێژە دان بەوەی وا هەیە ‹بـۆ کـوێ چـوو ئەوەنـدە سـوێند و پەیمان؟/ خۆت چووی و هەزار گوتەت لە پـەی مـان «هەژار، *مەم و زین*»› ٢. نەمردن؛ لە ژیانـدا بـوون ‹وەتەن سوێنم بـە کوێسـتانت، لـە ڕووی دنیـا هـەتا ماوم/ وەکوو ماسی بـە سـەربەسـتی، غەواسـی گێـژ و بنئاوم «قانع»› ٣. نەڕۆیشتن؛ مانـەوە ‹بـۆ دەردی جودایی مایەوە مەم/ دڵسـۆزێ نـەبێ ببێتـە هـاودەم «هەژار، *مەم و زین*»› ٤. مانەوە ‹خەرامان هاتوچوو دڵبەر، وەفایی ما بە ناکامی/ دریغا عومری شیرینم چ زوو هـات و چ زوو ڕۆیـی! «وەفـایی»› ٥. هـیچ ئاڵوگۆڕێک بە سەردا نەهاتن ‹ئـەم ماڵانـە هـەر وا ماوە› ٦. لە شـوێنی خۆیـدا بـوون ‹چـاوی مـاوە؟ دەستی پەڕیوە› ٧. مانەوە؛ دامـان؛ تێـدامان ‹مـام چی بێژم؟!› 🇮🇷 ١. ماندن ٢. زیستن ٣تا ٧. ماندن

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ماو/ چاوگی نەرێنی: نەمان

**مان**[2]: نـاو. ١. ☜ **مانگ ـ١** ٢. گـە؛ کـار و ڕەوتی وەسـتانەوە لـە هـەر کارێـک بـۆ نیشـاندانی ناڕەزایەتی 🇮🇷 ١. ☜ **مانگ ـ١** ٢. اعتصاب

⊡ **مـان کـردن**: گـەی کـردن؛ پـێ چەقانـدن و نەڕۆیشتن 🇮🇷 گَه گرفتن

**مان گرتن**: هەڕنین؛ خەزرین؛ جەنە گرتن ‹فـەڕ و فیکی ئەوە گرتی هەمووومان/ لـە داخـانی دەبـوو بگرن هەموو مان «هێمن»› 🇮🇷 اعتصاب کردن

**مان**[3]: جێناو. لکاوی یەکەم کەسی کۆ: ١. خاوەندی ‹سەرمان؛ ماڵمان؛ حاڵمان› ٢. بـەکار ‹خواردمـان؛ کردمان› 🇮🇷 ضمیر متصل اول شـخص جمـع: ١. ـ مان؛ ملکی ٢. ـ یم؛ فاعلی

**ـ مان**[١]: پاشگر. ١. شوێنی بوونی شتێک ‹نیشتمان؛ سازمان› ٢. بۆ دەربڕینی دۆخێک ‹پەشیمان؛ شادمان› ٣. ناوی چاوگ دروست دەکا ‹دوورمان؛ بریامان› ☰ ١و٢. مان ٣. وند اسم‌مصدرساز

**مان**[٥]: پیرۆ. ← **خان‌ومان**

**مانا** / mana/: ناو. گوزارە؛ واتا؛ نیاز لە قسە یان نووسراو ☰ معنی

**مانای** / manay /: چاوگ. مانستن؛ وێکچوون ‹چەنی باد سوبح بالا مەنمانۆ/ شکۆفەش بە شەوق ئافتاب مەمانۆ «بێسارانی»› ☰ مانند بودن

**مانایی** / manayî/: ئاوەڵناو. واتایی؛ سەر بە ئاوەز و هەست ☰ معنایی

**مانایێش** / manayîş/: چاوگ. وێکچوون ☰ شبیه بودن

**مانتۆ** / manto/: ناو. کراس یان کەوای زۆرتر فش و فۆل و درێژی ژنانە کە بە سەر جلەوە لە بەری دەکەن ☰ مانتو

**ماندک** / mandik/: ☜ **ماندوو**

**ماندگ** / mandig/: ☜ **ماندوو**

**ماندوێتی** / mand(i)wêtî/: ☜ **ماندوویی**

**ماندوو** / madû/: ئاوەڵناو. ماندک؛ ماندگ؛ ماندی؛ مانی؛ مانیا؛ مانگ؛ مانوو؛ مانیاگ؛ مەنە؛ شەکەت ‹بفڕێ بڕوا بۆ کوردستانی ئاوات/ ماندوو نەبێ هەر بڕوات و هەر بڕوات «گۆران»› ☰ خسته

▣ **ماندوو بوون**: شەکەت بوون؛ لە دەست دانی هێز و بڕست ☰ خسته شدن

**ماندوو کردن**: شەکەتی پێ دان ☰ خسته کردن

**ماندووەتی** / mandûwetî/: ☜ **ماندوویی**

**ماندوویەتی** / mandûyetî/: ناو. پاکەمی؛ مانگی؛ مانیاگی ☰ خستگی

**ماندوویی** / mandûyî/: ناو. ماندوێتی؛ ماندووەتی؛ شەکەتی. هەروەها: **ماندوویی نەناس؛ ماندوویی نەناسانە** ☰ خستگی

**ماندەڵ** / mandel/: ناو. حاشا ☰ انکار

**ماندەنە** / mandene/: ئاوەڵناو. ١. نەفەوتاو ٢. نیشتەجێ ☰ ١. ماندنی ٢. مُقیم

**ماندی** / mandî/: ☜ **ماندوو**

**مانسن** / manisin/: چاوگ. مینسن؛ وێچوون؛ لێچوون ☰ مانستن

**مانقاڵ** / manqal/: ☜ **مەنقەڵ**

**مانقڕ** / maqiř/: ناو. قۆشەیەکی پێشینە وەک شایی و فەتالی ☰ از اجزاء پول‌های قدیمی

**مانقووڵ** / manqûl/: ☜ **ماقووڵ**

**مانقێر** / manqêr/: ئاوەڵناو. هەژار و دەستەنگ؛ ڕووت و نەدار ☰ بینوا؛ مُستمند

**مانکەر** / manker/: ئاوەڵناو. مانگر؛ گەگر لە کاری ‹مانکەر بەشی ئەخورگێ «مەسەل»› ☰ اعتصابگر

**مانکەن** / manken/: ناو. ١. ئەو کەسە جل‌وبەرگی نوێ و تازەباو لە بەر دەکا و بە کڕیارانی پیشان دەدا ٢. پەیکەرێک لە مرۆڤ بۆ ڕانانی جل‌وبەرگی نوێ و تازەباو ٣. پەیکەرێک لە مرۆ بۆ ڕاهێنانی وەرزشی و فێر کردنی وەرزشوانان ☰ ١تا٣. مانکن

**مانگ** / mang/: ناو. ١. ماه؛ مەه؛ ما؛ هەیوی؛ هەیڤ؛ هایڤ؛ هەڤی؛ هەوی؛ کاوت؛ مات؛ مان؛ تەنێکی ئاسمانی کە هەر ٢٩،٥ شەوانەڕۆژ جارێک بە دەوری زەویندا هەڵدەسووڕێ و لە بەر تیشکی تاو دەدرەوشێتەوە ‹مانگ ئەوا تازە لە ئاسۆ دەردێ/ کۆمەڵێ هەورەسپیلکەی بەر دێ «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ٢. هەر تەنێکی ئاسمانی کە لە دەوری شتێکدا هەڵسووڕێت ٣. بەشێ لە دوازدە بەشی ساڵ کە ٢٨ تا ٣١ شەوانەڕۆژە و لە هەر زمانێکدا ناوێکی هەیە ٤. ☜ **ماداک** ☰ ١. ماه آسمان ٢. قمر ٣. ماه سال ۴. ☜ **ماداك**

▣ **مانگ تازە** ☜ **مانگی یەکشەوە**

**مانگ چواردە** بەدر؛ هەلاب؛ هلاب؛ مانگی پڕ؛

مانگێ پەڕە؛ مانگی چواردە؛ مانگی شەوی چواردە ≡ بدر؛ ماه تمام

**مانگ گاقۆڕ:** گەلاوێژ؛ ناوەڕاست مانگی هاوین ≡ مُرداد ماه

**مانگی خۆ:** ئەو مانگەی ئاوسی تێدا دەزێ ≡ ماه زایمان

**مانگی زایینی:** هەرکام لە مانگەکانی سالی زایینی ≡ ماه میلادی

**مانگی کۆچی:** مەودای نێوان جارێک سووڕانی مانگ لە دەوری زەوی تا سووڕانێکی‌تر ≡ ماه قمری

**مانگی نوێ:** ☜ **مانگی یەکشەوە**

**مانگی هەتاوی:** مانگی ڕۆژی؛ مانگەکانی سالی هەتاوی ≡ ماه شمسی

**مانگی یەکشەوە:** مانگیلە؛ مانگی نوێ؛ مانگ تازە؛ سەرەتای هاتنی مانگ ≡ هلال؛ ماه نو

▣ **مانگ گیران/ گیریان:** مان گیران؛ ڕەش هەلگەڕانی بەشێ یا گشت ڕووی مانگ لە کاتێدا کە لە عاسمان دیارە ≡ خسوف شدن

**مانگ هەلاتن:** مانگ دەرهاتن؛ دەرکەوتنی مانگ ≡ ماه درآمدن

**مانگ** / manig/: ☜ **ماندوو**

**مانگا** / manga/: ناو. مانگە؛ مانگەو؛ مۆنگا؛ مەگاو؛ چێڵ؛ دایکی گۆلک ≡ گاو ماده

**مانگادۆش** / mangadoş/: ناو. ١. سەتڵ؛ پەقرەج ٢. ئەو کەسەی مانگا دەدۆشێ ≡ ١. سطل شیر دوشی ٢. کسی که گاو را می‌دوشد

**مانگار** / mangar/: ئاوەلناو. ماو؛ مەندۆخ ≡ ماندگار

**مانگاشەو** / mangaşew/: ☜ **مانگەشەو**[1]

**مانگامژ** / mangamij/: ناو. مانگامژە؛ بەرخێ کە لە گوانی چێڵ شیر دەخوا ≡ برّه‌ای که از پستان گاو می‌مکد

**مانگامژە** / mangam(i)je/: ☜ **مانگامژ**

**مانگانە**[1] / mangane/: ئاوەلناو. مەهانی؛ مهانی؛ مەهی؛ مەهیتی: ١. سەر بە یەک مانگ ‹مووچەی مانگانە› ٢. سەر بە مانگ ‹بەلافۆکی مانگانە› ≡ ١و٢. ماهانه

**مانگانە**[2]: ئاوەلکار. مەهانی؛ مهانی؛ مەهی؛ مەهیتی؛ هاشمە؛ ئاشمە؛ لە هەر مانگێکدا ‹مانگانە پارەیەکی زۆر کرێ دووکانی دەدا› ≡ ماهانه

**مانگاوس** / mangawis/: ناو. مانگاوەس؛ گاوس؛ مەشکە لە پێستی چێل ≡ مشک از پوست گاو

**مانگاوەس** / mangawes/: ☜ **مانگاوس**

**مانگر** / mangir/: ئاوەلناو. مانگیر: ١. پەلپگر؛ گرووگر ٢. گەگر؛ پێچەقێن ≡ ١. بهانه‌گیر ٢. نرو

**مانگنامە** / mangname/: ناو. بەلافۆک، بەتایبەت گۆڤارێ کە مانگێ جارێ دەردەچێ ≡ ماهنامه

**مانگوڕ** / manguř/: ئاوەلناو. سەلت؛ بێشوو ≡ مُجرد (زن)

**مانگۆڕ** / mangoř/: ناو. قەیرەکچی شوو نەکردوو ≡ دختر تُرشیده

**مانگووری** / mangûrî/: ناو. بژیوی و بوود؛ ڕسق و ڕۆزی تێر و تەسەل ≡ دارایی کافی برای گُذران معاش

**مانگە** / mange/: ☜ **مانگا**

**مانگەسەوە** / mangesewe/: ناو. بەردێکی سپی بریقەدارە دەیکەنە خشل ≡ سنگی براّق و زینتی

**مانگەشەو**[1] / mangeşew/: ناو. ماتاب؛ ماتاو؛ مەهتاو؛ مانگاشەو: ١. تاڤهەیڤ؛ ترێفە ‹کانییەکی ڕوونی بەر تریفەی مانگەشەو، لە بنیا بلەرزێ مرواری زیخ و چەو/ جوانترە لە لای من لە دەریای بێ‌سنوور، شەپۆلی باتە بەر تیشکی خۆر، شلپ‌وهووڕ «گۆران»› ٢. *[مەجازی]* کچ و ژنی زۆر جوان وەک مانگ ≡ ١. مهتاب ٢. مهپاره

**مانگەشەو**[2]: ئاوەلکار. لە شەوێکدا کە مانگ بە دەرەوەیە ‹مانگەشەو دەچم› ≡ مهتاب

**مانگەشەوە** / mangeşewe/: ناو. بەردێکـە لـە بـەر خۆر چەند ڕەنگ دەدا ☰ سنگی زینتی

**مانگەو** / mangew/: ☜ **مانگا**

**مانگەومانگ** / mangewmang/: ئاوەڵکار. هـەر بـە سی ڕۆژ جارێک ‹مانگەومانگ پارە وەردەگـرێ› ☰ ماەبەماە

**مانگی** / mangî/: ئاوەڵـناو. سەر بە مانگ ‹کـۆچی ـ مانگی› ☰ قمری

**مانگی** / manigî/: ☜ **ماندوێتی**

**مانگیر** / mangîr/: ☜ **مانگر**

**مانگیلە** / mangîle/: ناو. ماهیچە: ۱. مـانگی تـازە ۲. شکڵی مانگی تازە لە ئاڵادا ☰ ۱. هلال ۲. نقش هلال در پرچم

**مـانگێر** / mangêr/: نـاو. درمـــغ؛ شـــەیەکی دەم بەرەوخوارە بۆ پووش کۆ کردنەوە ☰ شن‌کش

⊡ **مانگێر کرن**: مانگێر دەکار هێنان ☰ با شن‌کـش کار کردن

**مانمانـەگێجێ** / manmanegêcê/: نـاو. باوەخولـێ؛ گێژەوانک؛ بابەخولێ ☰ چرخش به دور خود

**مـانن** / manin/: چاوگ. مانـدوو کـردن؛ شـەکەت کردن ☰ خسته کردن

**مانـای** / mannay/: چـاوگ. مانـدوو کـردن ‹ئـی هەرمانێ تەمام مانناناش› ☰ خسته کردن

**مـانۆڕ** / manoř/: نـاو. ۱. کـار و ڕەوتی ڕاهێنـان و ئامادەسازی کۆمەڵێک بۆ بـارودۆخێکی نائاسـایی (بوومەلەرزە، شەڕی چەکداری و...) ۲. چالاکییەکی چەکداری بۆ گۆڕانی بارودۆخی گۆڕەپانی شەڕ ☰ ۱و۲. مانور

⊡ **مانۆڕ دان**: ۱. بەڕێوە بردنی مانۆڕ ۲. /*پلار*/ خـۆ نواندنی بێ ناوەڕۆک ‹هەر خەریکی مانۆڕ دانـە› ☰ ۱و۲. مانور دادن

**مانو** / manû/: ☜ **ماندو**

**مانـە** / mane/: نـاو. ۱. مـانی؛ هەنبانـە؛ هەمانـە؛ هەمبانە ۲. مانا؛ واتا ۳. بەهانە؛ پەڵپ ٤. مان؛ گە ٥. تیغـە؛ نێـوان ☰ ۱. انبـان ۲. معنـی ۳. بهانـه ۴. اعتصاب ۵. تیغه

**مانەک** / manek/: ☜ **مانەگی ـ۲**

**مانـەگـەزێ** / manegezê/: نـاو. چەکمـە؛ جزمـە؛ جەزمە ☰ چکمه

**مانـەگی** / manegî/: نـاو. ۱. زیـــنی ئەســـپ ۲. مانەک؛ ئەسپی ڕەسەن ☰ ۱. زیـن اسـب ۲. اسـب اصیل

**مانەن** / manen/: ☜ **مانەند**

**مانەند** / manend/: ئامراز. مانەن؛ وەک ☰ مانند

**مانـەوە** / manewe/: چـاوگ. تێپـەڕ. //مایـــەوە؛ دەمێنیەوە؛ بمێنەوە// ۱. نەڕۆیشتن و جێگیر بوون لە شوێنێ ‹ڕۆژگار گەوهەری وە بـن گـڵ دا/ داخـی ئەو مایەوە لە ناو دڵـدا «هـێمن»› ۲. بـەجێ مـان؛ بوون لە شوێنێکدا ‹مامەوە بە تاکی تەنیا› ۳. تەواو نەبوون ‹من ئەم هەموو داب و نەریتە پیرۆزانەیشـم/ لە باپیرە هەرە گەورەکانمەوە بۆ ماوەتەوە «شـێرکۆ»› ٤. نەمردن؛ درێژەدار بـوونی ژیـان ٥. داکـەوتن؛ قەتیس مان ☰ ۱. ماندگار شدن ۲. بازماندن ۳. باقی ماندن ۴. (زنده) ماندن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: مـاوەوە/ چـاوگی نـەرێنی: نەماشینەوە

**مانەوی** / manewî/: ئاوەڵناو. زندیق؛ شوێنکەوتووی یەکێ لە ئایینـە ئێرانییـەکان، بەتایبـەت ئـایینی مانی ☰ زندیق

**مانەی** / maney/: ناو. پەڵپ؛ بیانوو؛ بەهانە ☰ بهانە

**مـانی**[۱] / manî/: نـاو. ۱. ☜ **مانـە ـ۱** ۲. شـووفار؛ قسەبەر ☰ ۱. ☜ **مانە ـ۱** ۲. خبرچین

**مانی**[۲]: ☜ **ماندو**

**مانیا** / manya/: ☜ **ماندو**

**مانیـاق** / manyaq/: ئاوەڵناو. شێت؛ لێـوە؛ دێـن ☰ دیوانه

**مانیاگ** / manyag/: ☜ **ماندوو**

**مانیاگی** / manyagî/: ☜ **ماندوویەتی**

**مانیان** / manyan/: چاوگ. شەکەت بوون ☲ خسته شدن

**مانیای** / manyay/: چاوگ. ماندوو بوون ☲ خسته شدن

**مانیفێست** / manîfêst/: ناو. نووسراوەیەک کە لە لایەن پارت، تاقم یان کۆمەڵێکەوە، لەمەڕ بابەتێکی تایبەتەوە کە زۆرتر ئاگادارییەکی تێدا دراوە یان بیر و بۆچوونێکی پێ ڕوون کراوەتەوە ☲ مانیفیست؛ بیانیه

**مانیلا** / manîla/: ☜ **مەڵغە**

**مانیلوس** / manîlûs/: ☜ **مالینوس**

**ماو**[1] / maw/: ناوەڵناو. ماگ: ۱. نەمردوو ‹مانت گەرەکە؟ بەری نەمانە/ ماو ئەو کەسەیە لە خۆی نەبانە «هەژار، *مەم و زین*»› ۲. لە بەین نەچوو ☲ ۱. باقی؛ زنده ۲. مانده؛ از بین نرفته

• **ماو**[2]: پاشەوشە. نەڕۆیشتوو ‹جێماو› ☲ مانده

**ماوا** / mawa/: ناو. شوێن؛ جێگە ‹جەنانی وەک جینان کردم بە ماوا/ حەبیبەی مالیاوا مالی ئاوا «نالی»› ☲ مأوا؛ مکان

**ماوت** / mawit/: ☜ **ماهووت**

**ماورێژ** / mawřêj/: ناو. تاوە؛ ناوسنگانە ☲ ماهیتابه

**ماوزەڕ** / mawzeř/: ناو. جۆرێ تفەنگ ☲ نوعی تفنگ

**ماوزێ** / mawzê/: ناو. زا و ماک؛ ئاژاڵ و بێچووی تێکەڵ کراو بۆ لەوەڕ ☲ برە و بُزغالەی همراه مادران در چرا

**ماوس** / maws/: ناو. مەوس؛ کەرستەیەکی دەستی بۆ بزواندنی نیشاندەر لە سەر شاشەی کەمپیوتەر ☲ ماوس

**ماوش** / mawş/: ناو. ۱. گیرەی پیشەسازان ۲. گیرەی کتێب گوشینی جزوبەندی ۳. کونەبا؛ کونێ کە بای لێوە دێت ٤. هۆرە؛ پواز ☲ ۱. گیرەی صنعتگران ۲. منگنەی صحافی ۳. منفذ باد ۴. گاوە

**ماوڵ** / mawił/: ناو. قانە؛ دەرفەت ☲ مُهلت

**ماوە** / mawe/: ناو. ۱. ماوڵ؛ دەرفەت ‹جارێ ماوەمان ماوە› ۲. ئەندازە لە زەمان: *ئەلف*) کاتی پێویست بۆ تەواو بوونی کار، خول یان زنجیرەڕووداوێک ‹ماوەی ژیان› ب) کاتێک بە سەرەتا و ئاخری دیاریکراوەوە ‹ماوەی کاری ڕۆژانە هەشت ساعەتە› ج) پاژێک لە کات ‹ماوەی شەو و ڕۆژ لە هاوین و زستاندا جیاوازە› ۳. ئەندازەی جێ ٤. پاشماوە ☲ ۱. مُهلت ۲. مُدت ۳. مسافت ۴. بقیە؛ باقیمانده

▣ **ماوە دان**: ماوڵ/ مۆڵەت دان ☲ مُهلت دادن

**ماوەرد** / mawerd/: ناو. گوڵی گولاو ☲ گُل مُحمدی

**ماوەوە** / mawewe/: ناوەڵناو. ماو لە مێژینەوە ☲ بازمانده

**ماوەیەک** / maweyek/: جێناو. چەندێ؛ هێندێک؛ هێما بۆ زەمانێکی ناڕوون ☲ چندی

**ماوی** / mawî/: ناو. ۱. ☜ **مالۆس** ۲. ئاوی؛ کەوە ☲ ۱. ☜ **مالۆس** ۲. رنگ آبی

**ماوێژ** / mawîj/: ☜ **مێوژ**

**ماه** / mah/: ناو. ۱. ☜ **مانگ ـ۱** ۲. ما؛ زەرد؛ تیشە شاخی زۆر بڵندی لووس ‹گەیشتمە سەر ترۆپکی ئارەزوو ڕۆژێ، کەچی ڕوانیم/ لە پێشمدایە زەرد و ماه و سەخت و ئەستەمێکی تر «هێمن»› ☲ ۱. ☜ **مانگ ـ۱** ۲. صخرەی بلند و صاف

**ماهرە** / mahre/: ☜ **مارە**

**ماهف** / mahf/: ☜ **مەحو**

**ماهفوور** / mahfûr/: ☜ **مافوورە**

**ماهکومە** / mahkûme/: ناوەڵناو. ۱. مەحکووم؛ بە تاوانبار ناسراو ۲. ئەشقی؛ قاچاغ لە پۆلیس ☲ ۱.

محکوم ٢. فراری
**ماهنە** / mahne/: ناو. گە؛ گرِنە؛ گەی ☚ اعتصاب
**ماهوارە** / mahware/: ناو. سەتەلایت ☚ ماهواره
**ماه و زەرد** / mah û zerd/: ناو. ماهیزەرد؛ زەرد و ماه ☚ صخرەی صاف و بلند
**ماهو** / mahû/: ☜ مالۆس
**ماهوت** / mahût/: ناو. ماوت؛ پارچەیەکی کولکنە، زۆرتر دەکرێتە باڵتە ☚ ماهوت
**ماهور** / mahûr/: ناو. ١. یەکێ لە حەوت دەزگای مۆسیقای ئێرانی ٢. شاخی هەڵەمووت ☚ ١. ماهور ٢. کوه سنگی مُرتفع
**ماهەر** / maher/: ناو. ماکەر؛ دێڵەکەر ☚ مادەاُلاغ
**ماهەک** / mahek/: ناو. ڕەوتی پەنەمانی پێست لە پاش دەرزی تێ ڕۆ کردن و کوتان لە ئاوڵە ☚ ورم پوست بعد از مایەکوبی
**ماهی** / mahî/: ناو. مایی: ١. ماسی ٢. ئێسکە ماسییەکی زەردواشە دەکرێتە دەسکە خەنجەر ٣. شفرەی فیل و بەراز ☚ ١. ماهی ٢. نوعی استخوان ماهی که از آن دستەی خنجر سازند ٣. عاج
**ماهیچە** / mahîçe/: ☜ مانگیلە
**ماهیر** / mahîr/: ناوەلناو. مەلاح؛ لێزان؛ کارامە ☚ ماهر؛ خبره
**ماهیزەرد** / mahîzerd/: ☜ ماه وزەرد
**ماهین**[1] / mahîn/: چاوگ. مان ☚ ماندن
**ماهین**[2]: ناو. ١. نێر و مێی ئەسپ ٢. ☜ ماین ☚ ١. اسب و مادیان ٢. ☜ ماین
**ماهینانێ** / mahînanê/: ناو. ڕکەی ئەسپ غاردان؛ گرێوە غار ☚ مسابقەی اسبدوانی
**ماهینە** / mahîne/: ☜ ماین
**مای** / may/: ناو. ١. مایس؛ مەی؛ مانگی پێنجەمی ساڵی خاچپەرستان ٢. ☜ مادەر ☚ ١. ماه مە ٢. ☜ مادەر
**مایچە** / mayçe/: ناو. ١. ☜ ماسولکە ـ١ ٢. پاژنەی پەلەوەران ٣. سواغی گۆشەی حەوز ☚ ١. ☜ ماسولکە ـ١ ٢. پاشنەی طیور ٣. اندودەی گوشەی حوض
**مایدە** / mayde/: ناو. گومگومە؛ مەتارەی سەفەر ☚ قُمقمه
**مایس** / mays/: ناو. مای؛ مانگی مەی ☚ ماه مه
**مایسچنەک** / maysçinek/: ☜ ماسیگرە ـ١
**مایک** / mayk/: ناو. ١. مێوینە؛ مێچکە؛ بەرانبەری نێر ٢. مێوایەتی؛ بەرانبەری نێرایەتی ☚ ١. مادە ٢. مادگی
**مایکرۆوەیڤ** / maykroweyv/: ناو. ١. درێژایی شەپۆلی نێوان یەک تا سی میلیمیتر ٢. کەرەسەیەک بۆ خێرا گەرم کردنی خۆراک بە هۆی پێلی مایکرۆوەیڤەوە ☚ ١و٢. مایکروویو
**مایکە** / mayke/: ناو. مێوینە؛ مایک ☚ مادە (مخالف نر)
**مایکەی** / maykey/: ناو. مێوایەتی ☚ مادگی
**مایکی** / maykî/: ناو. مێوینەیی ☚ مادگی
**مایمارون** / maymarun/: ناو. مامااران؛ جۆرێ مارمێلکەی گەورە ☚ نوعی سوسمار درشت
**ماین**[1] / mayn/: چاوگ. مان ☚ ماندن
**ماین**[2]: ☜ مایین
**ماینبەراز** / maynberaz/: ناو. ماینوەراز؛ ئەسپی فەحل کە ماینی لێ چا دەکەن ☚ اسب گُشن
**ماینبەز** / maynbez/: ناو. کەرێ کە لە ماینان دەپەڕێ بۆ ئێستر پەیدا بوون ☚ خری کە بر مادیان سوار شود
**ماینچە** / maynçe/: ناو. پاژنەی باڵدار ☚ پاشنەی پرنده
**ماینچەقەڵ** / maynçeqeł/: ناو. چەرخوفەلەک؛ گەردوونە؛ کەرستەیەک بە ژمارەیەک سەندەڵییەوە کە بە دەور خولگەیەکدا هەڵدەسووڕێ و خەڵک بۆ خۆشی سواری دەبەن

☰ چرخ و فلکِ بازی

**ماین‌وەراز** / maynweraz/: ☜ **ماین‌بەراز**

**ماینـە** / mayne/: نـاو. مایـەن؛ ماینـە؛ مـێ؛ بەرانبەری نێرەوەز ☰ مادینە

**مایـە** / maye/: نـاو. ١. هـۆ؛ سـەبەب ‹مایـەی سەرشۆڕی› ٢. ماک ٣. دەسمایە؛ سەرمیان ‹مایە پـووچ› ٤. هـەوێن؛ ئامیـان ‹مایـەی پـەنیر› ٥. خەستی؛ تـیری ٦. پتـەوی؛ تۆکمـەیی ٧. دایـە؛ دایک ‹تتیل و بیبیل دەدایە/ دەرکێ وەکەن لە مایە «چیرۆکی کـۆن»› ٨. وشتری مێ؛ ما وشـتر ☰ ١. سبب ٢. مـاده ٣. سـرمایه ٤. مایـه (خمیـر و پنیـر) ٥. غلظت ٦. استحکام ٧. مادر ٨. شتر ماده

**مایەباش** / mayebaş/: ناو. نە قـازانج نـە زیـان ☰ مایەکاری

**مایەبۆش** / mayeboş/: ئاوەڵناو. ١. بە دەسمایـەی زۆرەوە ٢. دەسمایە لە دەست داو ☰ ١. سرمایەدار بزرگ ٢. ورشکسته

**مایەپووت** / mayepût/: ☜ **مایەپووچ**

**مایەپووچ** / mayepûç/: ئاوەڵناو. مایەپووت؛ نابووت؛ مـافنگی لـە سـەودادا ‹بـزانین کێمـان ڕاگـە گـم کەردین/ کێمـان مایـەپووچ کێمـان سـوود بـەردین «مەولەوی»› ☰ ورشکسته

**مایەدار** / mayedar/: ئاوەڵناو. ١. تیر؛ دژی شـل و تـراو ‹چـای مایـەدار› ٢. زۆر بـەدەوام و قـایم ٣. دەسمایـەدار ☰ ١. غلـیظ؛ پُرمایـە ٢. مُحکـم ٣. سرمایەدار

**مایەر** / mayer/: ناو. دایک ☰ مادر

**مایەسیر** / mayesîr/: ☜ **مایەسیری**

**مایەسیرە** / mayesîre/: ناو. ڕەزلەگاوانە ☰ مای‌مرز

**مایەسیری** / mayesîrî/: نـاو. مایەسـیر؛ بەواسـیر؛ بەوەسـیری؛ باوەسـیر؛ بێوەسـیری؛ بێوسـیری؛ باوەسـوری؛ گۆڵـنگ؛ نەخۆشـینی هەڵماسـینی ڕەشەدەمارەکانی دەوری کۆم کە دەبێتـە هـۆی ژان و خوێنـڕێژی و دژوار بـوونی دەس‌بـەئاو ☰ بواسیر

**مایەفتنە** / mayefitne/: ☜ **مایەفیتنە**

**مایەفیتنـە** / mayefitne/: ئاوەڵـناو. مایەفتنـــە؛ ئاژاوەچی ☰ مُفتن

**مایەمێو** / mayemêw/: ناو. جۆرێ تـرێ ☰ نـوعی انگور

**مایەن** / mayen/: ☜ **ماینە**

**مایەوەر** / mayewer/: ئاوەڵـناو. ١. بـە جەوهـەر؛ بەهونـەر ٢. دارا؛ دەوڵـەمەند ☰ ١. هنرمنـد ٢. ثروتمند

**مایی** / mayî/: ☜ **ماهی**

**ماییچنەک** / mayîçinek/: ☜ **ماسیگرە ـ١**

**مایچە** / mayîçe/: ☜ **ماسولکە ـ١**

**ماین** / mayîn/: ناو. ماهین؛ ماهینە؛ ماین؛ معین؛ مهان؛ مەعین؛ مەهین؛ مهین؛ میین؛ ئەسپی مێ ☰ مادیان

**ماینە** / mayîne/: ☜ **ماینە**

**مبارەک** / m(i)barek/: ☜ **موبارەك**

**مبارەکبادی** / m(i)barekbadî/: ☜ **موبارەکبایی**

**مبارەکبایی** / m(i)barekbayî/: ☜ **موبارەکبایی**

**مبارەکی** / m(i)barekî/: ☜ **موبارەکی**

**مباشیر** / m(i)başîr/: ☜ **موباشیر**

**مبال** / m(i)bal/: ☜ **مەبال**

**مبالات** / m(i)balat/: ناو. ڕەوتی گوێ‌دان بە کار و بار؛ بە گرینگ گـرتن؛ گرنگـی دان بـە کـارێ ☰ مُبالات

**مت**[1] / mit/: نـاو. ١. ☜ **میـت**[1]**ـ٣** ٢. زوورک؛ تەپکە؛ تەپە؛ بەرزایی لە زەمین ٣. سیپە؛ ڕەبەت؛ خەلەک ☰ ١. ☜ **میت**[1]**ـ٣** ٢. برآمـدگی زمـین ٣. کمین شکارچی

**مت**[2]: ئاوەڵـناو. ١. مـات و بێـدەنگ ٢. خـۆ وەشارتووی چاوەنۆڕی کێس لە دوژمن ئـانین ☰

١. مات و خاموش ٢. در کمین
⊡ **مت بوون:** بێده‌نگ بوون ‹مت ئه‌بن و ملیان ئه‌بێ به نیشانه‌ی سه‌ر سوورماندن «شێرکۆ»› ☰ ساکت شدن
**مت کرن:** ١. خۆ مات دان ٢. بێده‌نگ کـردن ☰ ١. کمین کردن ٢. ساکت کردن
**مت**[٢]: پیرۆ. ← **کوت‌ومت**
**متاره** / m(i)tare/: ناو. زباره؛ هه‌ره‌وه‌ز؛ گه‌له‌کۆمه ☰ تعاونی
**متالا** / m(i)tała/: ☜ **موتالا**
**متاندن** / m(i)tandin/: چاوگ. ١. لـه زه‌وی تونـد کردن ٢. به نهێم بـه هـه‌ردا دان ☰ ١. بـه زمـین چسباندن ٢. بر زمین کوفتن
**متاوێزه** / m(i)tawêze/: ناو. ویتامین ☰ ویتامین
**متبه‌خ** / mitbex/: ناو. ئاشپه‌زخانه ☰ آشپزخانه
**مترالیۆز** / mitralyoz/: ناو. مـه‌تره‌لوێز؛ مـه‌تره‌لۆز؛ ئاگربار؛ شێشتیر؛ ڕه‌شاش ☰ آتشبار
**مترب** / mitrib/: ناو. قه‌ره‌چی؛ کاولی ☰ کولی
**مترِبه** / mitirbe/: ☜ **موتوربه**
**متفه‌ڕک** / mitfeřik/: ئاوه‌ڵـناو. مووفـه‌ڕک؛ پـیرۆز؛ مباره‌ک ☰ مُتبرک
**متقاڵ** / mitqał/: ☜ **مسقاڵ ـ١**
**متک** / mitik/: ناو. گرد؛ ته‌پۆلکه ☰ تپه
**متمانه** / mitmane/: نـاو. بڕوایی؛ خاترجه‌می ‹ئـه‌و هه‌وه‌سبازانه جێی متمانـه نـین/ هـه‌ر ده‌زانـن گـوڵ چنین و بـه‌ی‌ڕنـین «هـێمن»›. هـه‌روه‌ها: **متمانـه کردن؛ متمانه پێ کردن** ☰ اطمینان
**متمانـه‌ پێکراو** / mitmanepêk(i)raw/: ئاوه‌ڵـناو. جێ‌باوه‌ڕ ☰ مُطمئن
**متن** / mitn/: ئاوه‌ڵناو. نـتم؛ کـه‌مقسـه؛ کـه‌مدوو؛ به‌رانبه‌ری وڕاج ☰ کم‌حرف
**متوربه** / m(i)turbe/: ☜ **موتوربه**
**متوربـه‌کـراو** / m(i)turbek(i)raw/: ئاوه‌ڵـناو. تاماندی؛ پێوه‌ن‌کراو ☰ پیوند شده
**متورفه** / m(i)turfe/: ☜ **موتورفه**
**متوملۆ** / mit û m(i)łû/: ناو. مڵ‌ومۆ؛ گه‌ڕان و بۆن کردنی سه‌گ بۆ په‌یدا کردن ☰ عمل بو کشیدن و جستجوی سگ
**متومور** / mit û mûr/: ☜ **مت‌وموورو**
**متومورک** / mit û mûrik/: ☜ **مت‌وموورو**
**متومورگ** / mit û mûrig/: ☜ **مت‌وموورو**
**متومـوورو** / mit û mûrû/: نـاو. مـت‌ومـوور؛ مـت‌ومـوورگ؛ مـت‌ومـوورک؛ مـت‌ومـووره؛ مـرت‌ومـوور؛ زه‌نگیانـه و مـوورووی تێکـه‌ڵاو ☰ مُهره‌های مُختلط
**متوموره** / mit û mûre/: ☜ **مت‌وموورو**
**متو** / m(i)tû/: ☜ **متوون**
**متـوون** / m(i)tûn/: ئاوه‌ڵـناو. متـوو؛ هـۆگر؛ خووپێگرتوو ☰ مأنوس
**مته**[١] / m(i)te/: ☜ **میت**[١]**ـ٣**
**مته**[٢]: ناو. به‌ده‌ڵ؛ زڕ؛ زڕه؛ نه به‌ڕاستی ☰ بدلی
**مته‌رێز** / m(i)terêz/: ☜ **مه‌ته‌رێز**
**مته‌شا** / m(i)teşa/: نـاو. مه‌ته‌شـا: ١. دارده‌سـتی گرێدار و ئه‌ستووری ده‌ستی ده‌روێشان ٢. *[کینایه، شووره‌یی]* ئه‌ندامی نێرینه‌ی زل ☰ ١. منتشا ٢. آلت تناسُلی بزرگ
**مته‌شێخ** / m(i)teşêx/: ناو. شێخی نه به‌ڕاستی؛ زڕه شێخ ☰ شیخ بدلی
**مته‌ق** / m(i)teq/: ناو. که‌مترین ده‌نگ ‹لێره دانیشه مته‌قت لـێ نه‌یـه تـا دێمـه‌وه!›. هـه‌روه‌ها: **مته‌ق نه‌کردن؛ مته‌ق (لێ) ده‌رنه‌هاتن** ☰ جیک؛ کمتـرین صدا
**مته‌لا** / m(i)tela/: ☜ **مته‌ڵلا**
**مته‌ڵلا** / m(i)tełla/: ئاوه‌ڵناو. مته‌لا؛ زێـڕکفت‌کـراو ☰ زراندود
**مته‌نجه‌نـه** / m(i)tencene/: نـاو. حه‌وترینگـه‌؛

چێشتێکە ☰ آش متنجان

**متەی** / m(i)tey/: چاوگ. ڕشتن؛ ڕیتن؛ ڕیهتن؛ ڕژاندن ‹متەن نە قالب سەبیکەی عیرفان/ وە زاخاو مالان زەنگەکەی خەزلان «مەولەوی»› ☰ ریختن

**متیان** / mityan/: ناو. کراس؛ گجی ☰ پیراهن

**متیل** / m(i)têl/: ناو. ١. کاکڵ؛ ناوئاخن ٢. گشتەکی لێفە دروون ٣. دۆشەک؛ دۆشکە ٤. پێخەف؛ نوێن (بەگشتی) ☰ ١. محتوا ٢. ریسمان لحافدوزی ٣. تُشک ۴. رختخواب

**مجبی** / micbî/: ناو. کەسێ کە پیتاکی خوێنبایی کۆ دەکاتەوە ☰ کسی کە خونبها را جمع می‌کند

**مجد** / micd/: ئاوەڵناو. دوور لە گاڵتە و گەپ ☰ جدّی

**مجرۆ** / micro/: ئاوەڵناو. ١. کوێر؛ کوێرە ٢. شەکەت؛ زۆر ماندوو ٣. گرفتاری زام و ئێش ☰ ١. نابینا ٢. بسیار خستە ٣. مجروح

**مجرۆیی** / microyî/: ناو. کوێری ☰ نابینایی

⊡ **مجرۆیی داهاتن**: لێلایی داهاتن: ١. کوێر بوون ٢. [کنایە] لە ڕووداوێ زۆر خەمبار بوون ☰ ١. نابینا شدن ٢. از حادثەای سخت اندوهگین شدن

**مجری** / micrî/: ناو. سندووقی چکۆلە ☰ صندوقچە؛ مجری

**مجک** / micik/: ☜ مجن

**مجلەور** / miclewir/: ☜ مێروولە

**مجلەوەر** / miclewer/: ☜ مێروولە

**مجن** / m(i)cin/: ئاوەڵناو. مجک؛ مجنک؛ چابوک؛ چابک؛ چالاک؛ زۆر بەکار ☰ چُست و چالاک

**مجنک** / micnik/: ☜ مجن

**مجەو** / m(i)cew/: ☜ برژانگ

**مجەور** / m(i)cewir/: ☜ مجێور

**مجیای** / micyay/: چاوگ. ڕژان ☰ ریختە شدن؛ جاری شدن

**مجێز** / m(i)cêz/: ناو. واز؛ ئیشتیا ☰ اشتها

**مجێفی** / m(i)cêfî/: ناو. جۆرێ هەنجیر ☰ نوعی انجیر

**مجێور** / m(i)cêwir/: ناو. مجەور؛ مچەور؛ خادم؛ خایەم؛ خام؛ خزمەتکاری مزگەوت ‹مجێوری مزگەوت مەنجەڵێکی خۆی دێنا، هەرچی بەرماوی ئەو خەڵکە بوو، بە سەر یەکی دادەکرد و ئەمەش جێژنانەی ئەو بوو «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ خادم مسجد

**مجێوری** / m(i)cêw(i)rî/: ناو. پیتاکی هەژاران بۆ دەس و پێوەندی ئاغادێ ☰ مالیاتی کە ارباب از رعیت می‌گیرد

**مچ**[1] / miç/: ناو. ١. کزن ٢. شە؛ نم ٣. کاری پێکەوە نان ٤. مچک؛ چنگنە ٥. گەنە ☰ ١. گاودانە ٢. نم ٣. عمل بر هم چسباندن ۴. حشرەای چسبندە ۵. کنە

⊡ **مچ کرن**: ١. گوێ قوت کردنی ئەسپ ٢. بە پێ شێلان ☰ ١. گوش تیز کردن اسب ٢. پامال کردن

**مچ**[2]: ئاوەڵناو. ١. چکووس؛ ڕژد؛ ڕەزیل؛ دەس‌قووچاو ٢. لیچق؛ لینج ٣. چەسپ و توند (قوڕ) ٤. ڕووگرژ ‹مچ و مۆڕ› ٥. ڕاست و قیت ☰ ١. خسیس ٢. لزج ٣. چسبناک (گِل) ۴. اخمو ۵. راست ایستادە

⊡ **مچ کردن**: پێکەوە نان؛ لێک گرێ دان ‹دەسی مچ کردووە› ☰ بر هم نهادن و بستن

**مچاندن** / m(i)çandin/: چاوگ. گلۆفین لە دەستا؛ گووشین بە قوچاندنی دەست ☰ مُچالە کردن

**مچرک** / m(i)çirik/: ☜ مچوڕک

**مچرگات** / m(i)çirgat/: ئاوەڵناو. چەتوون؛ سەخت ☰ دشوار

**مچڕاندن** / miçřandin/: چاوگ. مچڕین؛ دەست لە ناو دەست نان؛ تۆقە کردن؛ دەس و موشتاق کردن ☰ دست دادن

**مچرک** / m(i)çiřk/: ☜ **مچوڕك**

**مچرین** / miçřîn/: ☜ **مچراندن**

**مچقاندن** / miçqandin/: چاوگ. مچکاندن؛ ئاو لـه سـەرچاوە وشـک کـردن ■ آب از سرچشـمه خُشکاندن

**مچک** / miçik/: ناو. ١. ☜ **مچ^١ـ٤** ٢. مەرج؛ گرێو ■ ١. ☜ **مچ^١ـ٤** ٢. شرطبندی

**مچکاندن** / miçkandin/: چاوگ. ١. گرێـو کـردن؛ مەرج دانان ٢. ☜ **مچقاندن** ■ ١. شرط بستن ٢. ☜ **مچقاندن**

**مچکولی** / miçkulî/: ناو. پەلکی چاو؛ پێڵووی چـاو ■ پلک چشم

**مچکه**[١] / miçke/: نـاو. جـۆرێ زۆرەبـانی ■ نـوعی کُشتی

**مچکه**[٢]: ئاوەڵناو. چکووس؛ چکوود؛ ڕژد؛ سـەقیل ■ خسیس

**مچکین** / miçkîn/: چاوگ. وشک بوون ■ خُشکیدن

**مچلگه** / m(i)çilge/: ناو. باس و وت‌وویژ ■ بحث

**مچورک** / miçurk/: ☜ **مچوڕك**

**مچوڕک** / miçuřik/: نـاو. مچرک؛ مچڕک؛ مچـورک؛ مووچـڕک؛ مـووچڕک؛ مووچـەرک؛ مووچڕکـە؛ موچڕک؛ تەزووی لەش ‹ئاگرم لە جـەرگ بـەر بـوو، مچـوڕکێکم لـە بـەری پێـوە هـات و لـە تـۆقی سـەرم دەرچووَ؛ بەری چاوم تاریک بوو «هێمن»› ■ مور- مور

⊡ **مچوڕک بـه لەشدا هـاتن:** مووچـڕک بـە لەشـدا هاتن؛ مچوڕکە کردنی لەش ■ مور- مور شـدن بدن

**مچوله** / m(i)çuɫe/: ☜ **مچۆڵه**

**مچومۆڕ** / miç û mořr/: ☜ **مرومۆچ**

**مچۆڵـه** / m(i)çoɫe/: ئاوەڵـناو. مچوڵـە؛ ملـۆچە؛ میچۆڵە؛ میچۆلکە؛ مێچۆڵـە؛ مێچۆڵـکە؛ کلـۆف؛ گلۆف؛ گولۆف؛ گلفچ؛ قرمچ؛ لۆچ و پۆچ؛ بۆژیاگ؛ چـرچ و لـۆچ؛ گرمۆڵـە؛ نووشـت؛ تایبەتمەنـدی ئەوەی لە بـەر تـەوژم، بیچمـی تێکچـووە و خـڕ بۆتەوە و چۆتە یەک ‹کاغەزەکـەی مچۆڵـە کـرد و بڕکی دا› ■ مُچاله

**مچوون** / m(i)çûn/: ئاوەڵکار. هەمووَ؛ هەمە؛ تێکـڕا؛ بە تێکڕایی ■ همه

**مچه** / m(i)çe/: ناو. ١. ☜ **مووچـه ـ١** ٢. قـرنوو؛ پکرنوو؛ کـرنی؛ پکەولـە؛ مێروویـەکی پانکەڵـەی سووره بە ئاژەڵەوە دەنووسێ ■ ١. ☜ **مووچه ـ١** ٢. قراد؛ حشره‌ای کنه مانند

**مچەو** / m(i)çew/: نـاو. مـچ؛ نم؛ شـە؛ تـەڕایی ■ رطوبت

**مچەور** / m(i)çewir/: ☜ **مجێور**

**مچی** / m(i)çî/: نـاو. گـاوەک؛ کـەوگی؛ گەنـە؛ گەنەکەولە ■ کنه

**مچیان** / miçyan/: چاوگ. بە سەر یەکا توند بوون ‹مشتی مچیایه› ■ با فشار برهم آمدن

**مچینک** / m(i)çînik/: ☜ **مووچن**

**محاکەمه** / m(i)ĥakeme/: ناو. ١. لێ‌پرسینەوە؛ کـار و ڕەوتی دادگایی کردن؛ دەرخستنی تاوانباری یان بێ‌تاوانی کەسـێک بـە پرسـیار لـێ کـردن و پـێ ڕاگەیشتن بە بەڵگە و نیشـانەوە ٢. بـاس‌وخـواس کردن؛ سـین‌وجـیم کـردن؛ پـرس‌وجـۆی زۆر لـە کەسێ کردن ■ ١و٢. مُحاکمه

**محاڵ**[١] / m(i)ĥaɫ/: نـاو. ناوچە؛ کۆمەڵە ئاواییەک لە سەر زەمینێکدا کە سـەر بـە یـەکترین ‹محالـی شاروێران› ■ منطقه

**محاڵ**[٢]: ئاوەڵـناو. لـە دەسـەڵاتی بنیـادەم بـە دەر ‹شتی وا محاله و قەت ڕوو نادا› ■ محال

**محانج** / m(i)ĥanc/: ئاوەڵکار. مـەحانج؛ بـە بـێ ئامـانج ‹محـانج هەرچییـەکی گـرت!› ■ بـدون هدفگیری

**محەبەت** / m(i)ĥebbet/: ☜ **مۆڤەت**

**محەتته** / m(i)ĥette/: ☜ **محه‌ته**

**محەتە / m(i)ĥete/**: ناو. محەتتە؛ ئیزگا ☰ ایستگاه

**محەججەرە / m(i)ĥeccere/**: ☜ محەجەری

**محەججەری / m(i)ĥeccerî/**: ☜ محەجەری

**محەجەرە / m(i)ĥecere/**: ☜ محەجەری

**محەجــەری / m(i)ĥecerî/**: نــاو. محەجــــەرە؛ محەججەری؛ محەججەرە؛ محەنجەر؛ لاجامە (بەرهەیوان)؛ دەرەج؛ تەختەبەن؛ مەعجەرە؛ شیشبەند؛ تەلبەند؛ پێکهاتەیەک لە ڕزنێ میلەی چێوی یان کانزایی کە لە سەر و خوارەوە بە دوو میلەی درێژداکشاو گیردراون بۆ پەڕانپەڕی سەربان یان پەنای پلیکان و... ☰ نرده

**محەڕڕەم / m(i)ĥeřřem/**: ناو. محەڕەم؛ مانگی سەرەتای سالی کۆچی ـ مانگی ☰ ماه مُحرم

**محەڕەم / m(i)ĥeřem/**: ☜ محەڕڕەم

**محەس / m(i)ĥes/**: ناو. قاشاو؛ ڕنەک ☰ قشو

**محەک / m(i)ĥek/**: ☜ مەحەك

**محەل / m(i)ĥel/**: ناو. ١. دەم؛ کات ٢. جار؛ کەڕەت ☰ ١. زمان؛ هنگام ٢. بار؛ دفعه

**محەللەبی / m(i)ĥellebî/**: ☜ محەلەبی

**محەللەق / m(i)ĥelleq/**: ☜ محەلەق

**محەلە / m(i)ĥele/**: ناو. مەحەلە؛ مەهلا؛ تاخ؛ گەڕەک ☰ محله

**محەلەبی / m(i)ĥelebî/**: ناو. محەللەبی؛ محەلەبی؛ فرنی؛ شۆتینە؛ شلەخواردنێک لە ئاردەبرینج (یان نشاستە)، شیر و شەکر و گولاو و بڕێ جار وانیل، بۆ بۆنخۆشی ☰ فرنی

**محەلەق / m(i)ĥeleq/**: ناو. موحەللەق؛ موعەللەق؛ مەحەلەق؛ موحەلەق؛ تەقلە؛ مەقولات؛ قلۆپانی؛ سەرموقولات؛ محەللەق؛ جقلمبە؛ تۆمپز؛ کاری خۆ بەسەر سەردا ئاوەژوو کردنەوە ☰ پُشتک

**محەڵەبی / m(i)ĥełebî/**: ☜ محەلەبی

**محەنجەر / m(i)ĥencer/**: ☜ محەجەری

**محەندەک / m(i)ĥendek/**: ☜ محەنەك

**محەننەک / m(i)ĥennek/**: ☜ محەنەك

**محەنەک / m(i)ĥenek/**: ئاوەلناو. محەندەک؛ محەننەک؛ موحەننەک؛ ڕەسەن؛ نەجیب (ئەسپ) ☰ نجیب (اسب)

**محیت / m(i)ĥît/**: ناو. ئوقیانووس؛ زەریای گەورە ☰ اُقیانوس

**مخ / mix/**: دەنگەناو. مشە؛ دەنگی لووت ☰ صدای بینی

**مخابن / m(i)xabin/**: دەنگ. مەخابن؛ حەیف؛ بە داخەوە ‹ئەڵێم سەد مخابن! ئێستە نەماوە باوی› ☰ دریغ؛ دریغا

**مخارە / m(i)xare/**: ☜ مەغارە

**مخالف / m(i)xalif/**: ئاوەلناو. نەیار؛ دژ ☰ مُخالف

**مخانە / m(i)xane/**: ناو. مدەی؛ دوژمن؛ دژمن ☰ دشمن

**مخت / mixt/**: ناو. عەقل؛ ئاوەز ☰ عقل

**مختدار / mixtdar/**: ئاوەلناو. ژیر؛ ئاقڵ؛ خاوەن ئاوەز ☰ عاقل

**مخڕک / mixřik/**: ناو. ١. نەتەوی؛ دژمن ٢. گەلەکۆمەگی دژی کەسێ ☰ ١. دشمن ٢. گروه دشمنان یک نفر

**مخس / mixs/**: ناو. سەرناوی حاجی مەسیحی ☰ لقب حُجاج مسیحی

**مخل / mixil/**: ☜ مۆخڵ

**مخمخاندن / mixm(i)xandin/**: چاوگ. فلیقاندنەوە؛ پانەو کردن ☰ له کردن

**مخمور / mixmûr/**: ☜ مەخمەڵ

**مخورکە / mixurke/**: ☜ مۆرانە

**مخول / m(i)xul/**: ☜ مەخەل

**مخۆر / m(i)xor/**: ناو. دەمووکانە ☰ دبق

**مخەت / m(i)xet/**: ناو. ١. دارێ کە چەرمی پێ لووس دەکەن ٢. نیاز؛ مەبەست؛ قەست ‹مخەتم ئەوەیە بچمە شار› ☰ ١. چوب چرم صاف کن ٢.

قصد؛ نیّت

**مخەل** / m(i)xel/: ☜ **مۆخڵ**

**مخەمخ** / m(i)xemix/: دەنگەناو. مشەمش؛ دەنگی لووت ☰ صدای بینی

**مخەننەت** / m(i)xennet/: ناوەڵناو. مخەنەت: ١. ترسەنۆک؛ ترسۆنەک ٢. خوێڕی و بێکارە ٣. بێڕەگ؛ بێغیرەت ☰ ١. ترسو ٢. بیکارە ٣. بی‌غیرت

**مخەنەت** / m(i)xenet/: ☜ **مخەننەت**

**مدارا** / m(i)dara/: ناو. ١. سەبر و حەوسەلە؛ نەرمونیانی ‹لەگەڵ خەڵک مدارا بکە! وەک کردووتە› ٢. خۆڕاگری؛ پشوودرێژی ‹تۆزێ مدارا بکە! با شەڕی لێ هەڵنەستێ› ☰ ١و٢. مُدارا

**مداس** / m(i)das/: ناو. سۆڵ؛ سەرپایی؛ پێڵاوی سووکی بێ‌پاژنە ☰ دمپایی

**مدبرە** / midb(i)re/: ناو. کەژاڵ؛ ئاسک؛ خەزاڵ؛ مامز؛ مامبز ☰ آهو

**مدبەق** / midbeq/: ناو. ئاشپەزخانە؛ شوێنێ کە چێشت و نانی لێ چێ دەکەن ‹سەدان ساڵە لە ویرانەماڵی خۆمدا/ کتکەکوڕەی گۆشەی مدبەقی سوڵتانم/ سەدان ماڵە حەوش و بەرەی خۆم والایە و/ لە بەر دەرکەی دزانی خۆم پاسەوانم «پەشێو»› ☰ مطبخ

**مدده** / midde/: ☜ **مدەت**

**مددەت** / middet/: ☜ **مدەت**

**مددەعی** / midde'î/: ناو. دوژمن ☰ دشمن

**مدران** / midran/: چاوگ. ١. ڕاوەستان؛ وێستیان ٢. ئۆقرە گرتن ☰ ١. ایستادن ٢. آرمیدن

**مدرای** / midray/: چاوگ. ١. مدران؛ ڕاوەستان ٢. تەمرین ؛ کوژانەوەی ئاگر☰ ١. ایستادن ٢. خاموش شدن آتش

**مدرنای** / m(i)dirnay/: چاوگ. وەستاندن؛ وێسانن ☰ ایستاندن

**مدریک** / midrîk/: ناوەڵناو. وریا؛ زرەنگ ☰ زرنگ

**مدورماس** / m(i)durmas/: ناو. بەچکە ئاسکی چالاک و ئازا ☰ بچه آهوی تیزپا

**مدوەق** / midweq/: ☜ **موبەق**

**مدە** / m(i)de/: ناو. ١. ☜ **مدەت** ٢. [کینایە] تەمەن؛ عومر؛ ماوەی ژیان ‹خوا مدەی تەواو کردبوو› ☰ ١. ☜ **مدەت** ٢. عُمر

**مدەت** / m(i)det/: ناو. مددەت؛ مددە؛ مدە؛ ماوە لە زەمان ☰ مدت

**مدەک** / m(i)dek/: ناوەڵکار. دەمێک؛ دەمەک؛ سەرووەختێ ☰ مدتی

**مدەی** / m(i)dey/: ناو. دوژمن؛ دژم ☰ دشمن

**مدیر** / m(i)dîr/: ناو. مودیر؛ کارگێڕ؛ بەڕێوەبەر؛ ڕێڤەبەر؛ هەڵسووڕێن؛ ئەو کەسە بەڕێوە بردنی دامەزراوەیەکی لە ئەستۆدایە ☰ مُدیر

**مر**[1] / mir/: ناو. مرغ: ١. کەرگە؛ مریشک؛ مامر ٢. باڵندە؛ پەلەوەر ☰ ١. مُرغ خانگی ٢. پرنده

▪ **مر**[2]: پاشەوشە. مردوو ‹نەمر› ☰ میر

**مراتە** / m(i)rate/: ناو. لکی یەکساڵە؛ لقی تازەدەرچوو ☰ جوانەی یکساله

**مراد** / m(i)rad/: ناو. ١. ئارەزوو؛ حەز و نیازی دڵ ‹حەوش و ژووری مزگەوت لە ژن و کچ جمەی دەهات، بەردی دیواریان دەلستەوە کە بە مراد بگەن! «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. مەبەست ‹مرادیشم هەر شاعیرانی کوردستان وەک مەلا مارف و قانیع و فایق و پیرەمێرد و جگە لەوان بوو «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ ١. مُراد ٢. منظور

⊡ **بە مراد گەیین**: ١. بە ئاوات گەیشتن ٢. [کینایە] هاوسەر گرتن (زۆرتر ژن خواستن) ☰ ١. به مُراد رسیدن ٢. ازدواج کردن

**خوا مراد دان**: بە حەز و ئارەزوو گەیشتن ‹خوا مرادم با، باخم بەر بێنێ/ بۆ خۆم پێ‌خەسوو، کوڕم ژن بێنێ «فولکلۆر»› ☰ کامیاب شدن

**مرادحاسڵ** / m(i)radĥasił/: ئاوەڵناو. بەرخوردار؛ کامڕەوا ☚ کامیاب

**مرادخانی** / m(i)radxanî/: ناو. کورتەک؛ جۆرێ کەوای پیاوانە ☚ نوعی نیم‌تنەی مردانە

**مرار** / m(i)rar/: ☜ مردار¹ـ١

**مرارخۆر** / m(i)rarxor/: ئاوەڵناو. لاشەخۆر ☚ مُردارخور

**مراری** / m(i)rarî/: ☜ مرواری

**مراز** / m(i)raz/: ناو. نیازی دڵ ☚ مُراد

**مراڤ** / m(i)rav/: ☜ مراوی

**مراڤی** / m(i)ravî/: ☜ مراوی

**مران** / m(i)ran/: چاوگ. تینەپەڕ. //مرای؛ دەمرێی؛ بمرێ// بە کوشت چوون ☚ کُشتە شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: مراو/ چاوگی نەرێنی: نەمران

**مراندن** / m(i)randin/: چاوگ. مرانن؛ کوشتن؛ گوژتن ☚ کشتن

**مرانن** / m(i)ranin/: ☜ مراندن

**مراو¹** / m(i)raw/: ناو. ١. ☜ مراوی ٢. باڵندەی پێ‌بەپەردەی مەلەوان، لە هەموو جۆرێک ☚ ١. ☜ مراوی ٢. پرندەی آبزی

**ـ مراو²**: پاشەوشە. بە مردن‌چوو ‹مردوومراو› ☚ ـ مُردە

**مراوکە** / m(i)rawke/: ناو. گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ ☚ علفی درمانی

**مراوی** / m(i)rawî/: ناو. مراڤ؛ مراڤی؛ مەراڤی؛ مراو؛ ئۆردەک؛ وەردەک ☚ مُرغابی

**مراویخڕە** / m(i)rawîx(i)ře/: ☜ مراویڕەشکە

**مراویڕەشکە** / m(i)rawîřeşke/: ناو. مراویخڕە؛ مراویڕەشە؛ شڵەکە؛ جۆرێک مراوی کێوی سەرپشت ڕەش، بن‌سک سپی و سەر قاوەیی کە خەتێکی سپیی بە ملدا هاتووە ☚ اُردک چشم‌طلایی

**مراویڕەشە** / m(i)rawîřeşe/: ☜ مراویڕەشکە

**مراویسابوونی** / m(i)rawîsabûnî/: ☜ مراویسپیلکە

**مراویسپیلکە** / m(i)rawîs(i)pîlke/: ناو. بەحریلکە؛ مراویسابوونی؛ جۆرێک مراوی بۆرە، خاڵخاڵی سپی پێوەیە ☚ اُردک مرمری

**مرت** / mirt/: ناو. مت؛ مووروگی بچووک ☚ مُهرە

**مرتک** / mirtik/: ئاوەڵناو. بناوکەوتوو ☚ غوطەور در آب

**مرتوموور** / mirt û mûr/: ☜ متوموورو

**مرتۆخە** / mirtoxe/: ناو. چێشتی ئارد و ڕۆن و شەکر ☚ غذایی از آرد و روغن و شکر

**مرتە** / mirte/: ناو. ورتە؛ سرتە ☚ پچ پچ

**مرتین** / mirtîn/: ناو. شلی؛ سستی؛ خاویلکەیی ☚ سُستی

**مرتێل** / mirtêl/: ناو. دۆشەگ؛ دۆشەکە ☚ تُشک

**مرج** / mirc/: ناو. میرج؛ جۆرێ گەنم ☚ نوعی گندم

**مرجان** / mircan/: ناو. مووروێکی سوورە بۆ خشڵ دەکار دێ ☚ از مُهرەهای زینتی

**مرچ** / mirç/: ☜ ملچ

**مرچقاندن** / mirç(i)qandin/: چاوگ. ١. لە ناو پەنجەدا کوشین ٢. وردوخاش کردن ☚ ١. مُچالە کردن ٢. خُرد کردن

**مرچقین** / mirç(i)qîn/: چاوگ. ١. هەڵقرچان؛ قرچ بوون ٢. وردوخاش بوون ☚ ١. مُچالە شدن ٢. خُرد شدن

**مرچک** / mirçik/: ☜ چۆلەکە

**مرچکە** / mirç(i)ke/: ناو. مەلیچکی مێچکە؛ مێوە پاساری ☚ گُنجشک مادە

**مرچۆڵە** / mirçołe/: ناو. مرچیلە؛ باڵدارێکی بچووکی ڕەشە ☚ پرندەای کوچک و سیاه

**مرچە** / mirçe/: ☜ ملچ

**مرچەمرچ** / mirçemirç/: دەنگەناو. ملچەملچ؛ مرچی زۆر و لە شوێن یەک ☚ ملچ‌ملوچ

**مرچیله** / mirçîle/: ☜ **مرچۆڵە**

**مرخ**[1] / mirx/: ناو. ١. قرم؛ خەیاڵی تەماحکارانە ٢. زەوق؛ هێز و هەستی ئەنجام دانی کارێ ‹مرخی شیعر شتێکی خودادایيە و تەبعی مەوزوون دەگەڵ منداڵ دێتە سەر دنیا «هەژار، چێشتی مجێور»› ٣. واز؛ ئیشتیا ‹مرخم ناوا شتێک بخۆم› ☰ ١. هوس آزمندانه ٢. ذوق؛ طبع ٣. اشتها

⊡ **مرخ بردن**: ☜ **مرخ کردن**

**مرخ خۆش کردن**: تەماح کردن؛ قوم خۆش کردن ☰ طمع کردن

**مرخ کردن**: مرخ بردن؛ واز لێ بوون؛ ئیشتیا کردن ☰ اشتها کردن

**مرخ لێ پەڕین**: مرخ لێ چوون؛ تەماح تێکردن ☰ طمع کردن

**مرخ لێچوون**: ☜ **مرخ لێ پەڕین**

**مرخ**[2]: دەنگەناو. ١. پرخە ٢. دەنگی سینگ لە تەنگەنەفەسییەوە ☰ ١. خُرناسه ٢. صدای خِس‌خِس سینه از تنگی نفس

**مرخاندن** / mirxandin/: چاوگ. پرخاندن؛ پرخە کردن ☰ خُرناسه کشیدن

**مرخک** / mirxik/: ناو. بەنێکە لە تەوندا ☰ نخی در قالیبافی

**مرخن** / mirxin/: ناوەڵناو. مرخنە: ١. پرخەکەر ٢. تایبەتمەندی کەسێ کە تەنگەنەفەسە و دەنگ لە سنگیەوە دێت ☰ ١. خُرخُرو ٢. خِس‌خِسو

**مرخنای** / mirxnay/: چاوگ. مرخەمرخ کردن ☰ خُرخُر کردن

**مرخنە** / mirx(i)ne/: ☜ **مرخن**

**مرخە** / mirxe/: دەنگەناو. ١. پرخەی خەو ٢. هەسکە؛ دەنگی سنگی تەنگەنەفەس ٣. *[مەجازی]* هەناسە ‹مستێکی تێسرەواند، مرخەی بڕی «هەژار، قورئان»› ☰ ١. خُرناسه ٢. خِس‌خِس سینه ٣. نفس

**مرخەک** / mirxek/: ناو. ١. ماکوو؛ جێگەی ماسوولەی جۆلایی ٢. گلۆلەی فرێت ☰ ١. مکوک بافنده ٢. گلوله‌ی نخ

**مرخەمرخ** / mirxemirx/: دەنگەناو. مرخەی زۆر ☰ خُرخُر متوالی

**مرخێس** / mirxês/: ناو. ١. جێگەی لێ گەوزینی یەکسم ٢. حەقلیمەقۆ؛ هەرا و چەقە ☰ ١. غلتگاه چارپایان ٢. داد و قال

**مرخێسانێ** / mirxêsanê/: ناو. گەمەی یەکتر دە خۆڵ گەوزاندن و هەرا و هوریا کردن ☰ بازی همدیگر را در خاک غلتانیدن و داد و قال کردن

**مرخێش** / mirxêş/: ناو. ١. دۆخی هەناسە سوار بوون بە کێشانی شتی قورس ٢. کاری مل دەبەر ملی یەک نان ☰ ١. حالت بە هِن هِن افتادن از حمل شیئ سنگین ٢. عمل گلاویز شدن

**مرخێش**[1] . **مرخێش** / mirxêş mirxêş/: ناو. هەناسەسواری بە بۆنەی کێشانی شتی قورس ‹کوڕە! ئەوە مرخێش ـ مرخێش چتانە؟› ☰ هِن ـ هِن از کشیدن چیز سنگین

**مرخێش** . **مرخێش**[2]: ناوەڵکار. هەسکەهەسک ‹مرخێش ـ مرخێش کابرایان هێنا› ☰ با خستگی و هِن ـ هِن از کشیدن چیز سنگین

**مرد** / mird/: ناوەڵناو. مڕ؛ تێر؛ تەسەل ☰ سیر

**مرداخۆ** / mirdaxo/: ناو. کاری خواردن تا تەواو تێر بوون؛ مڕ بوون ☰ عمل خوردن تا کاملاً سیر شدن

**مردار**[1] / mirdar/: ناو. ١. مرار؛ مرداڵ؛ مندار؛ موردار؛ لاشەی فڕێدراو ٢. تووکەبەر ☰ ١. مُردار ٢. موی زهار

**مردار**[2]: ناوەڵناو. پیس و گلاو ☰ پلید

⊡ **مردار بوون**: بێ سەر بڕین گیان دەرچوونی حەیوانی حەلال گۆشت ☰ مُردار شدن

**مردار بوونەوە**: مردارەوە بوون؛ مندار بوونەوە: ١. مردار بوون ٢. *[پلار]* خرپ خەو لێکەوتن ☰ ١.

مُردار شدن ٢. به خواب رفتن

**مردار کردن:** مندار کردنەوە؛ مردار کردنـەوە: ١. سەر بڕینی بە غەڵەت ٢. مراندنی حەیوان بێ سەر بڕین ☰ ١و٢. مُردار کردن

**مردارەوە بوون:** ☜ **مردار بوونەوە**

**مردار کردنەوە:** ☜ **مردار کردن**

**مردارخۆر**[1] / mirdarxor/: ناو. لاشخۆر ☰ مُردارخوار

**مردارخۆر**[2]: ئاوەڵناو. *[کینایە]* گەندەخۆر؛ چکووس ☰ خسیس

**مردارسەنگ** / mirdarseng/: ناو. مرداسەنگ؛ مەرداسەنگ؛ بەردێکی ناسک و تورتە بۆ دەرمانی خوروو بە کار دێ ☰ مُردارسنگ دارویی

**مردارەمانگ** / mirdaremang/: ناو. گەلاوێژ؛ ناوەڕاست مانگی هاوین کە پاتاڵی زۆر تێدا زایە دەبێ ☰ مُردادماه

**مردارەوبوگ** / mirdarewbûg/: ☜ **مردارەوەبوو**

**مردارەوەبوو** / mirdarewebû/: ئاوەڵناو. مردارەوبووگ؛ مندارەوەبوو: ١. گیان‌دەرچوو بە بێ سەر بڕین ٢. *[پلار]* مل‌باریک و قیرسیچمە ☰ ١. مُردارشده ٢. مُردنی لجباز

**مرداری** / mirdarî/: ناو. ١. لاشەی مردار ٢. گلاوی؛ پیسی ٣. *[کینایە]* پیسایی بنیادەم ☰ ١. لاشەی مردار ٢. پلیدی ٣. مدفوع آدمی

**مرداسەنگ** / mirdaseng/: ☜ **مردارسەنگ**

**مرداق** / mirdaq/: ☜ **مەردیاق**

**مرداڵ**[1] / mirdał/: ☜ **مردار**[1]**ـ١**

**مرداڵ**[2]: ئاوەڵناو. ١. بەستەزمان؛ بەسەزوان ٢. لەجەر و بێ‌هێز ☰ ١. فقیر ٢. لاغرمُردنی؛ لاجون

**مرداڵخوەر** / mirdałx(i)wer/: ناو. خەرتەڵ؛ خەردال؛ دالاش؛ سوورەدال ☰ دال

**مردانە** / mirdane/: ناو. مڕی؛ تەسەلی؛ تێر و پڕی ☰ نهایت سیری

**مرداو** / mirdaw/: ناو. مردواو؛ گەبەڵ؛ تالاو؛ زەلکاو؛ قۆپی؛ قۆپیە؛ مەرازە؛ گۆلەئاوێکی مەند و پەل کە لە زێبارێک جوێ بۆتەوە یان لە یەک‌گرتنەوەی چەند چۆم بەدیهاتووە ☰ مُرداب

**مردگ** / mirdig/: ☜ **مردوو**

**مردگشۆر** / mirdigşor/: ☜ **مردووشۆر**

**مردگی** / mird(i)gî/: ☜ **مردوویی**

**مردن** / mirdin/: چاوگ. تێنەپەڕ. //مردی؛ دەمری؛ بمرە// مرن؛ مۆردەن؛ مەردەن؛ مەردەنە: ١. گیان دان؛ هەڵپڵۆسکان؛ هەڵپڵۆسکیان؛ ماڵ کردن؛ گیان کەندن؛ چاو سپی بوون؛ گاندایش؛ گان ڤەتش؛ هاتنە لا؛ دوایی هاتنی ژین؛ گیان لە لەشدا نەمان ‹مردنێکی لە بەر ئەو قاپییەدا مەردانە/ بە خودا چاترە ئەمرۆ لە گلاراوی حەیات «مەحوی»› ٢. *[مەجازی]* زۆر تامەزرۆی شتێ بوون ‹مردم بۆ پیالەیەک چایی!› ٣. *[مەجازی]* تووشی سەختەتی و دژواری ئەستەم هاتن ‹سەد جار مردم و زیندوو بوومەوە!› ٤. *[مەجازی]* زۆر خۆش ویستنی کەس یان شتێ ‹بۆت دەمرم خۆشەویستەکەم!› ٥. *[مەجازی]* زۆر ماندوو بوون و لە هێز کەوتن ‹با وچانێک بەین، مردین!› ☰ ١تا٥. مُردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: مردوو/ چاوگی نەرێنی: نەمردن

⊡ **مردن و سووتان:** *[مەجازی]* کۆشش کردن و تەقالای زۆر دان (زیاتر پێش ڕستەیەکی نەرێنی دەگوترێ) ‹مردم و سووتام دەگەڵم نەهات!› ☰ کوشش و تمنای زیاد کردن

**مردواو** / mird(i)waw/: ☜ **مرداو**

**مردۆخ** / mirdox/: ☜ **مردۆخە**

**مردۆخە** / mirdoxe/: ئاوەڵناو. مردۆخ؛ لەڕ و لاوازی بێ‌تین و تاو ☰ لاغرمُردنی

**مردوو**[1] / mirdû/: ناو. ماردا؛ مارده؛ مردگ؛ مردی؛ مری؛ مریک؛ مەردا؛ مەردش؛ مردە؛ مەردە؛ کەسی گیان لە لەشدا نەماو ‹مردوو کە مرد،

شەیتان لە کۆڵی ئەبێتەوە! «مەسەل»› ≡ مُرده

**مردوو٢**: ئاوەڵناو. ماردا؛ مارده؛ مردگ؛ مردی؛ مری؛ مریک؛ مەردا؛ مەردش؛ مرده؛ مەرده: ١. گیان تێدا نەماو ‹کوڕی کابرای مردوو کەوڵێکی تیسکنی ئاودامێنی لە پێش شێخ محەممەد دانا، گوتی: باوکم وەسیەتی کردووە تۆ دەبەری کەی! «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. لە تین و تاو کەوتوو ‹قسڵی مردوو؛ گێچی مردوو› ٣. دڵنەماو؛ هیلاک ‹کابرا مردووی دەسەڵاتە› ٤. لە بیرەوە چوو ‹زمانی مردوو› ≡ ١. مُرده ٢. ویژگی هر چیزی که حرارت یا خاصیتش را از دست داده ٣. شیفته ٤. از یاد رفته

⊡ **مردوو لێ مردن**: *[کنایە]* زۆر خەمگین و دڵپەشۆکاو بوون ‹ئەو چاوانەی هەڵیان دێنی/ بە کل و دەرمان دەیڕازێنی/ ڕۆژ نییە مردووم لێ نەمرێنی «فولکلۆر»› ≡ بسیار غمگین شدن

**ـ مردوو٢**: پاشەوشە. سیس و ژاکاو ‹چاومردوو؛ دڵمردوو› ≡ ـ مرده

**مردووپەرستی** / mirdûperistî/: ناو. مردەپەرستی؛ ڕێزنانی لەڕادەبەدەر لە مردوان و ڕابردوان و شانازی پێ‌کردنیان ≡ مُردەپرستی

**مردووتمرێ** / mirdûtm(i)rê/: نزا. قسەی سەرکۆنە کردن ‹گوتم تا کەی لە خانی وەسلی تۆ نەومید و بێبەش بم/ کوتی: مردووتمرێ عاشق بە دایم زار و مەحروومە «کوردی»› ≡ کلمەی سرزنش

**مردووچ** / mirdûç/: ئاوەڵناو. پەرۆش؛ کز و خەمبار ≡ پریشان

**مردووشۆر** / mirdûşor/: ناو. مردەشۆر؛ مریشۆ؛ مریشۆر؛ مردگشۆر؛ مردیشۆر؛ مەردەشۆر؛ مردێشوو؛ لەش‌شوور؛ کەسێ کە مردوو پێش کفن کردن دەشۆرێ ≡ مُردەشور

**مردووشۆرخانە** / mirdûşorxane/: ناو. مەردەشۆرخانە؛ شوێنی مردوو لێ شتن ≡ مُردەشورخانە

**مردوولاوێن** / mirdûlawên/: ناو. مردوولاوێنەوە؛ سەردولکەبێژ؛ نەهاری؛ بلاو ≡ نوحەخوان

**مردوولاوێنەوە**/ mirdûlawênewe/: ☜ **مردوولاوێن**

**مردوولە** / mirdûle/: ☜ **مردەڵە**

**مردوومراو١** / mirdûm(i)raw/: ناو. مردەموودار؛ مردوومردوو؛ تازیەبار ≡ صاحب‌عزا

**مردوومراو٢**: نزا. مردەموودار؛ قسەیەکی لۆمە و تانەیە ≡ کلمەی طعنە و سرزنش

**مردوومردوو** / mirdûmirdû/: ☜ **مردوومراو١**

**مردوویی** / mirdûyî/: ناو. مردگی؛ لە دۆخی مردندا ‹بە مردوویش نیشانەی گوللەیە ئەو کەللە پڕشۆڕە/ ئەوێستاش دەرسی سەربازی دەڵێ ئەو شاعیرە ڕندە «هێمن»› ≡ مُردگی

**مردە** / mirde/: ☜ **مردەماڵ ـ٢**

**مردەئارەق** / mirde'areq/: ناو. خوێ دانی دەمی مردن ≡ عرق دم مرگ

**مردەپەرستی** / mirdeperistî/: ☜ **مردووپەرستی**

**مردەڕێ** / mirdeřê/: ناو. میرات ≡ مُردەریگ

**مردەشۆر** / mirdeşor/: ☜ **مردووشۆر**

**مردەلۆخ** / mrdelox/: ئاوەڵناو. *[پلار]* قەوزیل؛ مەڕەمووکە؛ لەڕ و لاواز و بێهێز ≡ لاغرمُردنی

**مردەلۆخە** / mirdeloxe/: ☜ **مردەڵە**

**مردەڵە** / mirdeɫe/: ئاوەڵناو. مردوولە؛ مردەلۆخە؛ مریلە؛ لاوازی چکۆلە ≡ لاغر کوچک‌اندام

**مردەماڵ** / mirdemaɫ/: ناو. مەردەماڵ: ١. ئەو بەشە لە ماڵ و دارایی کە ناگۆزرێتەوە (وەک زەوی، ماڵ و باخ) ٢. مردە؛ ماڵ و دارایی بێجگە ئاژەڵ و زیندەوەر ≡ ١. اموال غیرمنقول ٢. ثروت غیر زنده

**مردەملاس** / mirdem(i)ɫas/: ئاوەڵناو. *[پلار]* فیقنە؛ داڵگۆشت ≡ لاغر مردنی

**مردەموو** / mirdemû/: ناو. تازیە؛ ماتەم ≡ ماتم

**مردەموودار** / mirdemûdar/: ☜ **مردوومراو**

**مردەوزیندە** / mirde w zînde/: ناو. حەشارگەی بە پووش و پەلاش داپۆشراو ☰ کمینگاه پوشیده با شاخ و برگ

**مردەی** / mirdey/: چاوگ. وەستان؛ وێسیان ☰ ایستادن

**مردی** / mirdî/: ☜ مردوو

**مردیاق** / mird(i)yaq/: ☜ مەردیاق

**مردیشۆر** / mirdîşor/: ☜ مردووشۆر

**مردێشو** / mirdêşû/: ☜ مردووشۆر

**مرژان** / mirjan/: ☜ مەرجان

**مرژنگ** / mirjing/: ☜ برژانگ

**مرشۆر** / mirşor/: ☜ مورشید ـ٢

**مرشید** / mirşîd/: ☜ مورشید

**مرغ** / mirğ/: ☜ مر[1]

**مرق**[1] / mirq/: ناو. مرک؛ جەغەتاو؛ جەقەتاو؛ چەورایی سەر گۆشتاو ☰ چربی روی آبگوشت

**مرق**[2]: دەنگەناو. مرک: ١. جۆرێ دەنگ لە گەرووڕا، وەک دەنگی تەگە لە وەختی تێبەردانـدا ٢. دەنگی بە تاسە و لەز مژینی مەمکی دایک (بۆ بەرخی دەڵێن) ☰ ١. نوعی صدا از گلو ٢. صدای با اشتیاق مکیدن پستان مادر (از برّه)

⊡ **مرق لێدان:** مەمک مژینی بە هەڵپە و تاسە ☰ مکیدن پستان با اشتیاق و شتاب

**مرقان** / mirqan/: ☜ مرقاندن

**مرقاندن** / mirqandin/: چاوگ. مرقان؛ مرقانن: ١. مرق کردن؛ دەنگ لە گەروو هێنان بەبێ دەم کردنەوە ٢. دەنگ دەرهاتنی بەران، تەگە، بەراز و ... کاتی جووت بوون لەگەڵ مێیاندا ‹با وجوودی بێ جلی و بێ کا و جۆیی دائیما/ دێتە سەر پشتی دەمرقێنی وەکوو بزنی تەگە «سالم»› ☰ ١. با دهان بسته صدا از گلو درآوردن ٢. صدا کردن قوچ هنگام جُفتگیری

**مرقانن** / mirqanin/: ☜ مرقاندن

**مرقنای** / mirqnay/: چاوگ. مرقاندن؛ مرقەمرق کردن ☰ صدا از گلو درآوردن

**مرقە** / mirqe/: دەنگەناو. مرکە؛ مقە: ١. دەنگی گەروو بە دەمی قووچاو ‹موریدی میحنەت و دەردم غەمی تۆ پیر و مەولامە/ لە مرقەی سۆفی و هاوار و جەزبەی تۆبەکارم چی «ناری»› ٢. دەنگی بەران لە کاتی جووت بووندا ☰ ١. صدایی کە از گلو با دهن بستە می‌آید ٢. صدای قوچ هنگام جُفتگیری

⊡ **مرقە کردن:** مرقانن؛ مرقاندن ☰ صدا از گلو درآوردن

**مرقەمرق** / mirqemirq/: دەنگەناو. پەیتا پەیتای مرقەی بەران ☰ صدای پیاپی قوچ هنگام جفتگیری

**مرک**[1] / mirk/: ناو. ١. ئانیشک؛ قنگانیسک ٢. کەپەک؛ برش؛ سفی ٣. کرێژی سەر ٤. گە؛ مان ☰ ١. آرنج ٢. کفک ٣. شورەی سر ۴. اعتصاب

**مرک**[2]: ☜ مرق

**مرکاندن** / mirkandin/: چاوگ. مرکانن: ١. مرقانن؛ مرقاندن ٢. بێدەنگ کردن ٣. هێور کردنەوە ☰ ١. با دهان بستە صدا از گلو درآوردن ٢. ساکت کردن ٣. آرام کردن

**مرکانن** / mirkanin/: ☜ مرکاندن

**مرکانە** / mirkane/: ناو. مەرکانە؛ مەرکانە؛ شاکاشی؛ کوپەڵەی گوشاد ☰ سبوی گشاد

**مرکنایرە** / mirknayre/: چاوگ. دامرکاندن ☰ آرام کردن

**مرکە** / mirke/: ☜ مرقە

**مرکیایرە** / mirkyayre/: چاوگ. دامرکان ☰ آرام گرفتن

**مرمرک** / mirmirik/: ناو. جۆرێ پێشکە ☰ نوعی پشه

**مرمرۆک** / mirm(i)rok/: ناوەڵناو. مردوولە؛ مریچۆک؛ شل و کز و کەنەفت ☰ لاجون

**مرمرین** / mirm(i)rîn/: چاوگ. بە پەلەپەل قسە کردن کە کەس تێ نەگا ☰ هول‌هولکی سخن گفتن

**مرمەکی** / mirmekî/: ناو. دەرمانێکە ☰ مرمکی؛ دارویی است

**مرن** / mirin/: ☜ **مردن**

**مروا** / mirwa/: ناو. جالجالووکە؛ کاکلەمووشان ☰ عنکبوت

**مروار** / mirwar/: ناو. ١. ☜ **ماشاو** ٢. جۆرێ دارەبی کە بۆ نەجارِی باشە ☰ ١. ☜ **ماشاو** ٢. نوعی چوب بید

**مرواری** / mirwarî/: ناو. مراری؛ ماگرت؛ دوڕ؛ بەردی گرانبایی و بریقەداری نێو قاپێلکی نەرملەشان ☰ مروارید

**مروچلە** / m(i)ruç(i)łe/: ناو. مێرووی ڕەشی وردیلە ☰ مورچەی سیاه ریز

**مروژە** / m(i)ruje/: ☜ **مێروولە**

**مروەت** / mirwet/: ناو. مرۆت؛ مرووەت؛ جوامێری ☰ انسانیّت

**مروێ** / mirwê/: ☜ **هەرمێ**

**مرۆ** / m(i)ro/: ☜ **مرۆڤ**

**مرۆت** / m(i)rot/: ☜ **مروەت**

**مرۆترسێن** / m(i)rotirsên/: ئاوەڵناو. نەتەڵە؛ ترسێنەر ☰ ترساننده

**مرۆچانە** / m(i)roçane/: ناو. مرۆچلێ؛ مرۆژانە؛ مرووژانە؛ مرۆچە؛ ملۆچە؛ گزگز؛ چرژانە؛ ئاژاشکە؛ خوری‌خاو؛ خوری‌وخاو؛ هەستێک وەک هەستی ڕۆشتنی مێروو لە سەر پێست، بە هۆی سەرما، ترس یان نەخۆشییەوە ☰ مورمور تن

⊡ **مرۆچانە کردن**: خوران و تەزینی پێست ☰ مورمور شدن پوست

**مرۆچلە** / m(i)roçłe/: ☜ **مێروولە**

**مرۆچلێ** / m(i)roçłê/: ☜ **مرۆچانە**

**مرۆچە** / m(i)roçe/: ناو. ١. ☜ **مێروولە** ٢. مرووچە؛ کوڵی وردی ئاو ٣. مرووچە؛ مرۆژانە؛ چۆنیەتی خوران و تەزینی پێست ☰ ١. ☜ **مێروولە** ٢. جوش آهستەی آب ٣. مورمور بدن

⊡ **مرۆچە کردن**: مرووچە کردن: ١. تەزین و خورانی پێست ٢. تازە قوڵت دانی ئاو ☰ ١. مورمور کردن ٢. نرم جوشیدن آب

**مرۆخۆر** / m(i)roxor/: ئاوەڵناو. زیندی‌خۆر ☰ آدمخوار

**مرۆخە** / m(i)roxe/: ناو. ١. ☜ **مۆرەغە** ٢. مێشکی ناو ئێسکی لەش ☰ ١. ☜ **مۆرەغە** ٢. مغز استخوان

**مرۆد** / m(i)rod/: ☜ **مرید**

**مرۆدۆستی** / m(i)rodostî/: ☜ **مرۆڤدۆستی**

**مرۆر** / m(i)ror/: ناو. دەنکێکی تاڵە لە ناو گەنمدا ☰ تلخک گندمزار

**مرۆزن** / m(i)rozin/: ئاوەڵناو. ١. بە قرِە و هەرا ٢. ڕووگرژ؛ ناوچاوترش ٣. بەبۆڵەبۆڵ ☰ ١. جیقو ٢. اخمو ٣. غُرغُرو

**مرۆژانە** / m(i)rojane/: ☜ **مرۆچانە**

**مرۆش** / m(i)roş/: ناو. گوڕە ☰ خروش

**مرۆشیان** / m(i)roşyan/: چاوگ. گوڕاندن ☰ خروشیدن

**مرۆغە** / m(i)roğe/: ☜ **مۆرەغە**

**مرۆڤ** / m(i)rov/: ناو. مرۆ؛ مەرڤ؛ مەرۆڤ؛ مەروو؛ مەری؛ مهۆ: ١. بنیادەم؛ ئینسان ‹مرۆڤ دێتە سەر زەمینێ/ خۆشی و ناخۆشیان دەبینێ «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ٢. خزم؛ قەوم ٣. بەردەس؛ خزمەتکار ٤. *[مەجازی]* جوامێر؛ مرۆی چاک و پاک ‹ئەمە کەی مرۆڤە؟› ٥. تاک؛ کەس ☰ ١. بشر؛ انسان ٢. خویشاوند ٣. زیردست ۴. انسان خوب ۵. فرد

**مرۆڤاتی** / m(i)rovatî/: ☜ **مرۆڤایەتی**

**مرۆڤانی** / m(i)rovanî/: ناو. ۱. چاکە؛ خاسی ۲. خزمایەتی؛ قەومی ☰ ۱. نیکوکاری ۲. خویشاوندی

**مرۆڤایەتی** / m(i)rovayetî/: ناو. مرۆڤاتی؛ مرۆڤانی؛ مرۆگی؛ ئینسانەتی: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی مرۆڤ بوون ۲. جوامێری؛ ئاکار و کردەوەی مرۆڤانی ‹سەری لە مرۆڤایەتی نابێتەوە› ☰ ۱و۲. انسانیت

**مرۆڤدۆستی** / m(i)rovdostî/: ناو. مرۆدۆستی؛ دۆخی خۆش‌گەرەک بوونی مرۆڤ و یارمەتی‌دانی و هاوەردی‌کردن لەگەڵیدا و تەقالا دان بۆ خۆشحاڵ و خۆشبەخت کردنی ☰ انسان‌دوستی

**مرۆک** / m(i)rok/: ئاوەڵناو. کوشندە؛ کوژەک ‹نەخۆشییەکی مرۆکی گرتووە› ☰ کُشنده

**مرۆکوژ** / m(i)rokuj/: ئاوەڵناو. خوێنڕێژ؛ قاتل. هەروەها: **مرۆکوژی** ☰ آدمکُش

**مرۆگی** / m(i)rogî/: ☜ **مرۆڤایەتی**

**مرۆی** / m(i)roy/: ☜ **هەرمێ**

**مروو** / m(i)rû/: ناو. ۱. ☜ **هەرمێ** ۲. مۆریانە ☰ ۱. ☜ **هەرمێ** ۲. موریانە

**مرووچ** / m(i)rûç/: ئاوەڵناو. ۱. کز و خەمبار ۲. کەم‌بەخت؛ چارەڕەش ☰ ۱. اندوهگین ۲. بدشانس

**مرووچە** / m(i)rûçe/: ☜ **مرۆچە**

⊡ **مرووچە کردن**: ☜ **مرۆچە کردن**

**مرووز**[1] / m(i)rûz/: ناو. ۱. گنجی دەم و چاو ۲. ڕووگرژی ☰ ۱. چین و چروک صورت ۲. اخم

**مرووز**[2]: ئاوەڵناو. ۱. کۆڵەوار؛ بەدبەخت ۲. خەفەتبار؛ خەمبار ☰ ۱. بدشانس ۲. غمگین

**مرووژ** / m(i)rûj/: ☜ **مێرووله**

**مرووژانە** / m(i)rûjane/: ☜ **مرۆچانە**

**مرووژە** / m(i)rûje/: ☜ **مێرووله**

**مرووس** / m(i)rûs/: ناو. مریس؛ کار و ڕەوتی لووشین؛ هەڵمژین ☰ عمل برمکیدن

**مرووسی** / m(i)rûsî/: ئاوەڵناو. مریسی؛ تایبەتمەندی خواردنەوەیێ کە بە هەڵلووشران دەخورێ ☰ برمکیدنی

**مرووسین** / m(i)rûsîn/: چاوگ. هەڵلووشین ☰ برمکیدن

**مرووشی** / m(i)rûşî/: ☜ **مریشی**

**مرووەت** / m(i)rûwet/: ناو. مروەت؛ مرووەت؛ جوامێری ‹تەڵەبی ڕەحم و مرووەت لە دڵی ئەهلی زەمان/ تەڵەبی ئاوی حەیاتە لە سەرابستانا «مەحوی»› ☰ انسانیّت

**مروویژ** / m(i)rûyj/: ☜ **مێرووله**

**مرەبا** / m(i)reba/: ناو. مرەببا؛ مورەبا؛ لاچەژ؛ ڕیچار؛ ڕیچاڵ؛ ڕەچەڵ؛ میوەی (وەک: سێو، بەی، قەیسی، توورک و...) لە شەکردا کوڵێندراوی خەست‌هەڵگەڕاو ☰ مربا

**مرەباخی** / m(i)rebaxî/: ناو. مرەلارە؛ باڵندەیەکە لە تۆرەمەی شێلاقە لە لێڕەوار بە تەنیا دەژی، بە هۆی ئەوەی کە بە ڕەنگی گەڵای وشکی دارانە و کەمتر جوولە دەکا نابینرێ ☰ ابیا

**مرەببا** / m(i)rebba/: ☜ **مرەبا**

**مرەڕەشتی** / m(i)reřeştî/: ناو. مریشکەتارانی؛ مریشکەشامی؛ چین‌وماچین؛ مریشکێ ئاقێ؛ جۆرێ مریشکی سەرکەچەڵی کونجی دەنگ ناخۆش ☰ نوعی ماکیان

**مرەڕەشە** / m(i)reřeşe/: ناو. قەل مراوی ☰ مُرغابی سیاه

**مرەکەڕە** / m(i)rekeře/: ناو. کەڕواڵە؛ هەوێردە ☰ بلدرچین

**مرەکێفی** / m(i)rekêfî/: ناو. باڵدارێکە لە مریشک بچووکترە، کەوی نابێ ☰ پرندەای وحشی از مرغ خانگی کوچکتر

**مرەلارە** / m(i)relare/: ☜ **مرەباخی**

**مری**[1] / m(i)rî/: ناو. باڵدارێکی کێوییە ☰ پرندەای است

**مری**: ☜ **مردوو**

**مریچک** / m(i)rîçik/: ناو. مریچکە؛ چێشکەی مێوە؛ چۆلەکەی مێوینە ☱ گُنجشک مادە

**مریچکە** / m(i)rîçke/: ☜ **مریچك**

**مریچلە** / m(i)rîçle/: ☜ **چۆلەکە**

**مریچڵە** / m(i)rîçłe/: ☜ **چۆلەکە**

**مریچڵێ** / m(i)rîçłê/: ناو. مۆرووچلێ؛ چۆلەکە؛ چووچک؛ چوێلەکە ☱ گنجشک

**مریچۆک** / m(i)rîçok/: ☜ **مرمرۆك**

**مریچە** / m(i)rîçe/: ☜ **مێرولە**

**مریچەڕەشە** / m(i)rîçeřeşe/: ناو. سێرووڕ؛ ڕەشۆڵە؛ گاوانی ☱ سار سیاه

**مرید** / m(i)rîd/: ناو. مرۆد؛ موریـد: ١. پەیڕەوی پیری تەریقەت ٢. هۆگر؛ لایەنگری سەرسەختی ئایین، شێوازی هونەری یان کەسێکی گەورە ‹مریدی هەژار› ☱ ١و٢. مُرید

**مریژ** / m(i)rîj/: ☜ **مێرولە**

**مریستن** / m(i)rîstin/: چاوگ. مژین ☱ مکیدن

**مریسمریسۆک** / m(i)rîsm(i)rîsok/: ناو. گیایەکی کێوییە بۆنی ڕێحانە دەدا ☱ ریحان کوهی

**مریسۆک** / m(i)rîsok/: ناو. گیای مژمژە ☱ گیاهی است

**مریسی** / m(i)rîsî/: ناو‌ەڵناو. مەختە؛ مژراو ☱ مکیده

**مریشک** / m(i)rîşk/: ناو. مامر ☱ مرغ خانگی

◙ **مریشکی حەبەشە**: ☜ **مریشکەکێوی**

**مریشکی زەلکاو**: تاوسە ☱ طاووسک

**مریشکی ئـاقی**: ١. ☜ **مـرەڕەشـتی** ٢. ☜ **مریشکەشامی ـ٢** ٣. بۆقلە؛ عەلەشیش ☱ ١. ☜ **مرەڕەشتی** ٢. ☜ **مریشکەشامی ـ٢** ٣. بوقلمون

**مریشکی قۆقۆ**: ١. ☜ **مریشکەشامی ـ٢** ٢. بۆقلە ☱ ١. ☜ **مریشکەشامی ـ٢** ٢. بوقلمون

**مریشکی کوێی**: مریشکە کێوی ☱ مُرغ وحشی

**مریشکی کەدی**: مریشکی ماڵی ☱ مُرغ خانگی

**مریشکاوی** / m(i)rîşkawî/: ☜ **مریشکاویلە**

**مریشکاویلە** / m(i)rîşkawîle/: ناو. مریشکاوی؛ مرێک: ١. تۆرەمە باڵندەیەکە لە گۆل و زەلاندا دەژیـن، مەلەوانی چاکن، زۆرتـر خـۆ حەشـار دەدەن، باڵیان کـورت و کلکیان کولـە و قیـت ڕایدەگرن، باڵێک دەفڕن و لە کاتی فڕیندا لاقیان شۆڕ دەکەنەوە، بریتین لـە: ڕەشبەشـە، تاوسـە، مریشکاویلە و ... ٢. نـاوی باڵندەیەکە لـەم تۆرەمەیە، نزیک ٣٠ سانتیمیتر دەبێ، دنـدووکی سوور و درێژ، پشتی قاوەیی، سەرمل و سـینگی بۆری مەیلەو شـین، بـەر زگـی ڕێ ــ ڕێ و زۆر سلە، زۆرتر خۆ حەشار دەدا. لە گیا و گوڵـی نـاو ئاو، قامیشەلان، گۆلاوان، قەراغ جۆگە و جۆبـاران دەبینرێت ☱ ١. یلوه ٢. یلوه آبی

**مریشکبەشک** / m(i)rîşkbeş(i)k/: نـاو. مریشـکە کێوی ☱ مرغ وحشی

**مریشکەتارانی** / m(i)rîşketaranî/: ☜ **مرەڕەشتی**

**مریشکەڕاوڕە** / m(i)rîşkeřaw(i)re/: ناو. مـەلێکی کێوییە ☱ پرندەای کوهی

**مریشکەڕەشە** / m(i)rîşkeřeşe/: ناو. ١. مامری سیا ٢. ☜ **مریشکەکێوی** ٣. *[کنایە]* سوورەتی نەسـر، وەک دەڵێن، قورعانخوێنی لای مەلا دەگەیشتە ئـەو سـوورەیە، لـە سـەری بـوو مریشـکێک بـۆ مامۆسـتا بێنـێ ☱ ١. مـرغ سـیاه رنـگ ٢. ☜ **مریشکەکێوی** ٣. سورەی نصر در قرآن

**مریشکەشـــامی** / m(i)rîşkeşamî/: نـــاو. ١. مریشکیشامی؛ چین و ماچین؛ جۆرێ مریشـکی سەرکەچەڵـی ئاوڵـەڕووی دەنـگ ناخۆشـە ٢. مریشـکێ قۆقـۆ؛ مریشـکێ ئاقـێ؛ مریشـکی ئەستۆدرێژی بێتووک ☱ ١. نوعی ماکیان ٢. مـرغ لاری

**مریشکەکێوی** / m(i)rîşkekêwî/: نـاو. ڕەشبەشـە؛

کوڕەبەشــە؛ گامــارۆ؛ مریشکەڕەشــە؛ مریشــکی حەبەشە؛ ناوی باڵندەیەکی کێوییە ☰ چنگر

**مریشکەهندی** / m(i)rşkehindî/: ناو. چین‌وماچین؛ مریشکەتارانی ☰ مُرغ شاخدار

**مریشۆ** / m(i)rîşo/: ☜ مردوشۆر

**مریشۆر** / m(i)rîşor/: ☜ مردوشۆر

**مریشی** / m(i)rîşî/: ناو. مرووشی؛ جـۆرێ گـەنمی نەباش ☰ نوعی گندم نامرغوب

**مریک** / m(i)rîk/: ☜ مردو

**مریکار** / m(i)rîkar/: ئاوەڵـناو. تاسەبار؛ تامـەزرۆ ☰ آرزومند

**مریکانە** / m(i)rîkane/: نـاو. پـەتای مریشـک ☰ طاعون مُرغ

**مریلە** / m(i)rîle/: ☜ مردەڵە

**مریەم** / m(i)ryem/: ☜ مەریەم

**مرێبا** / m(i)rêba/: نـاو. ١. خزم؛ خوێش؛ قەوم ٢. ڕەنجبەری ساڵ بە کرێ ٣. کرێکاری سێ یـەک بـەر ٤. کـار و ڕەوتی چانـدن و پێگەیانـدن بـە نیـوەیی ☰ ١. خویشـاوند ٢. کشـاورز مُـزدور ٣. کشاورزی بـا مُـزد یـک سـوم محصـول ۴. کشـت و برداشت نصف به نصف به نسبت کار و سرمایه

**مرێس**[١] / m(i)rês/: ☜ مرووس

**مرێس**[٢]: ئاوەڵـناو. تـەکووز؛ ڕێـک‌وپێـک ☰ مرتـب؛ منظم

**مرێسی** / m(i)rêsî/: نـاو. ١. ☜ مرووسـی ٢. ڕێک‌وپێکی ☰ ١. ☜ مرووسی ٢. نظم

**مرێشکە** / m(i)rêşke/: ناو. برێشکە؛ دانەوێڵەی لـە سەر سێڵ بۆدراو ☰ دانەی بوداده

**مرێک** / m(i)rêk/: ☜ مریشکاوی

**مڕ**[١] / miř/: دەنگەناو. ١. مۆڕ؛ کاری بە چـاوی زەق ڕوانین ٢. بۆڵەی سەگ و پشی و ... لە ڕکان ☰ ١. اخم ٢. صدای لندیدن سگ و گربه و ... از خشم

⊡ **مڕ بردنەوە:** مۆڕ بردنەوە؛ ناوچاو تاڵ کـردن ☰ اخم کردن

**مڕ**[٢]: ئاوەڵـناو. ١. زۆر تێر ‹ئەوەنـدەی خـواردووە مـڕ بووە› ٢. ڕووگرژ؛ ناوچاوتاڵ ‹مڕ و مۆچ› ٣. مات و ئامادە بۆ ئامباز بوون ٤. تـۆز؛ زۆر ورد ‹خۆڵـەمڕ› ٥. بز؛ زەق؛ زل ☰ ١. بسیار سیر ٢. اخمو ٣. به زمین چسبیده و آمادەی جهش ۴. گرد؛ بسیار ریز ۵. خیـره؛ چشم برآمده

⊡ **مڕ بوون:** تـەواو تێـر بـوون ‹یابـای عەسـکەر و زەڕینی جاشە!/ ڕێوی مـڕ بـووە و لاشـە بەلاشـە! «هەژار، بۆ کوردستان»› ☰ کاملاً سیر شدن

**مڕ**[٣]: پێرۆ. ← مشت‌ومڕ

**مڕ**[٤]: لێل. ← مڕوموش

**مڕان** / m(i)řan/: چاوگ. بۆلانـدنی بـە تـووڕەیی سەگ؛ گەف کردنی سەگ ☰ غُریـدن تهدیـدآمیز سگ

**مڕاندن** / m(i)řandin/: چاوگ. تێنەپەڕ. //مڕانـدت؛ دەمڕێنی؛ بمڕێنە// مڕانن؛ مڕان؛ مڕنای؛ مڕمـڕین؛ گەف کردنی سەگ ☰ غُریدن تهدیدآمیز سگ

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەمڕاندن

**مڕانن** / m(i)řanin/: ☜ مڕاندن

**مڕژاندن** / miřjandin/: چاوگ. مڕاندنی سـەگ ☰ غرولند کردن سگ

**مڕشۆد** / miřşod/: ☜ مورشید

**مڕشید** / miřşîd/: ☜ مورشید

**مڕک** / miřk/: ناو. پەتا؛ هەلامەت؛ پەسیو ☰ زُکام

**مڕکـی** / miřkî/: ئاوەڵـناو. پەسـیف‌داری؛ هەلامەت‌گرتوو ☰ مُبتلا به زُکام

**مڕمڕک** / miřmiřik/: نـاو. جـۆرێ تـرێ ☰ نـوعی انگور

**مڕمڕین** / miřm(i)řîn/: ☜ مڕاندن

**مڕمەنـد** / miřmend/: نـاو. مـووڕەد؛ مـەورە؛ مەورەت؛ مەورەد؛ بڕبەند ☰ سوهان

**مڕمیاو** / miřm(i)yaw/: ☜ مڕناو

**مرناو** / /miřnaw/: دەنگەناو. مرمیاو؛ مرنیاو؛ دەنگی زلی گوڕیە 🇮🇷 صدای بم گُربەی نر

**مرنای** / /miřnay/: ☜ مراندن

**مرنیاو** / /miřn(i)yaw/: ☜ مرناو

**مروا** / /miřwa/: ناو. فاڵ؛ خێره 🇮🇷 فال

**مرومشت** / /miř û mişt/: ☜ مشتومڕ

**مروموّچ** / /miř û moç/: ناوەڵناو. مچومۆڕ؛ مڕوموّچ؛ مڵومووچ؛ مۆچ؛ مۆڕ؛ مۆن؛ مووچ؛ مڕومۆن؛ ڕووگرژ؛ ڕووترش ‹ڕووترش و گرژۆک و گوێ نەبیستوو/ گرژ و مرومۆچ و کەس نەویستوو «هەژار، مەم و زین»› 🇮🇷 اخمو

**مرومۆچی** / /miř û moçî/: ناو. مۆنی؛ ڕووگرژی 🇮🇷 بداخمی

**مرومۆن** / /miř û mon/: ☜ مرومۆچ

**مروموچ** / /miř û mûç/: ☜ مرومۆچ

**مروموش** / /miř û mûş/: ناو. کار و ڕەوتی بۆن بە زەمینەوە کردن بۆ دۆزینەوەی خواردەمەنی ‹ڕێوی مروموش دەکا› 🇮🇷 عمل بو کشیدن و جستجوی خوراک

**مرۆیانی** / /m(i)řoyanî/: ناو. مرۆڤایەتی؛ چاکە 🇮🇷 انسانیّت

**مرو** / /m(i)řû/: ناو. ۱. دەردێکە لە مێوژ ئەدا وشکی دەکا ۲. مێلێکی شانەهەنگوین ۳. ئیشتیا؛ مگێز ‹مرووم بۆ هیچێ ناچێ› 🇮🇷 ۱. آفتی برای مویز ۲. آفتی برای شانەی عسل ۳. اشتها

◻ **مرو شکان**: تێر بوون؛ تاسە شکان ‹چی لێ نەخۆم، مرووم لێ ناشکێ!› 🇮🇷 سیر شدن

**مرووشکێن** / /m(i)řûş(i)kên/: ناوەڵناو. ۱. تاسەشکێن ۲. نەوس کوێرکەر 🇮🇷 ۱و۲. هوس‌کُش

**مرووهێن** / /m(i)řûhên/: ناوەڵناو. ۱. تاسەبزوێن ۲. نەوس هەستێن 🇮🇷 ۱و۲. هوس‌انگیز

**مرە** / /m(i)ře/: دەنگەناو. گەفی سەگ و پشیلە 🇮🇷 غُرش سگ و گربە

**مرەمر** / /m(i)řemiř/: دەنگەناو. مرەی لە دووی یەک 🇮🇷 غُرش پیاپی سگ و گربە

**مری** / /m(i)řî/: ناو. تێری و پری 🇮🇷 سیری و پُری

**مریای** / /m(i)řyay/: چاوگ. شکان؛ شکیان 🇮🇷 شکستن

**مز**[1] / /miz/: ناو. ۱. مزد؛ مزە؛ ماجوو؛ کرێ؛ هەقدەست؛ حەقدەس؛ کارانە؛ کرا؛ کراهە؛ ئاوان؛ پاداشی لە بەرامبەر کارەوە (نە وەک مووچە کە پتر مانگانەیە) ۲. قەڵایی ۳. بەچکە ئاسک ٤. کاری ڕێک گوشین 🇮🇷 ۱. مُزد ۲. قلع ۳. بچە آهو ۴. عمل فشُردن

◻ **مز دان**: ڕێک کوشین 🇮🇷 در آغوش فشُردن

**مز**[2]: ☜ مزر-۲

**مزئاش** / /miz'aş/: ناو. مزە؛ ئاردەمزی ئاشەوان 🇮🇷 مُزد آسیابان از غلە

**مزا** / /m(i)za/: ناو. سرپ؛ مەرمی؛ سورب؛ سرفت 🇮🇷 سُرب

**مزاج** / /m(i)zac/: ☜ مەزاج

**مزاش** / /m(i)zaş/: ناو. بەشێ لە گەنم کە دەدرێ بە ئاسیاوان 🇮🇷 مُزد آسیابان

**مزاندن** / /m(i)zandin/: چاوگ. ۱. لکاندن؛ چەسپاندن؛ پێوە نووساندن ۲. بە کزی دوان 🇮🇷 ۱. چسباندن ۲. آهستە صحبت کردن

**مزانی** / /m(i)zanî/: ☜ مزگێنی

**مزانیدەر** / /m(i)zanîder/: ☜ مزگێنیدەر

**مزاور** / /m(i)zawir/: ناوەڵناو. فێڵباز؛ گزیکەر؛ دەسبڕ 🇮🇷 حیلەگر

**مزبەر** / /mizber/: ناو. مزی؛ مزیار؛ کرێگرتە 🇮🇷 مُزدور

**مزچ** / /mizç/: ناو. بزە؛ زەردەخەنە 🇮🇷 تبسّم

**مزچین** / /mizçîn/: چاوگ. بزە کردن؛ زەردەخەنە کردن 🇮🇷 تبسُم کردن

**مزد** / /mizd/: ☜ مز[1]-۱

**مزدار** / mizdar/: ناو. جگی کۆڵدراوی قەلایی تێ کراو بۆ کەلاییێن ≡ شتالنگ آکنده از قلع

**مزدە** / mizde/: ☜ **مزدەر**

**مزدەر** / mizder/: ناو. مزدە؛ کەسێ کە مز دەدا ≡ مُزددهنده

**مزر** / mizr/: ناوەڵناو. ١. ترش ٢. مز؛ ترش و شیرین ‹هەناری مزر› ≡ ١. ترش ٢. مَلَس

**مزراح** / mizraĥ/: ناو. ١. ☜ **مزراق** ٢. سوورەقانگ؛ کەرسەڕ؛ جۆرێک قاز-مراوییە ≡ ١. ☜ **مزراق** ٢. أنقوت

**مزراحێن** / mizraĥên/: ☜ **مزراقێن**

**مزراق** / mizraq/: ناو. مزراح؛ مزرەق؛ مزرێح؛ مەزرەق؛ مەزرێح؛ خولخولەیێ کە بەنی تێ دەهاڵێنن و دەیهاوێن و دەسووڕێ ≡ گردنا

**مزراقێن** / mizraqên/: ناو. مزرەقێن؛ مزراحێن؛ بازی بە مزراح ≡ بازی مازالاق

**مزراویکە** / mizrawîke/: ☜ **مزراویلکە**

**مزراویلکە** / mizrawîlke/: ناو. مزراویکە؛ مزرۆکە؛ مزرەکە؛ مزەورە؛ جلبرووکە؛ چێشتی سماق و هێلکە ≡ آش سُماق و تخم‌مرغ

**مزرۆکە** / mizroke/: ☜ **مزراویلکە**

**مزرە** / mizre/: ناو. ئاوجۆ؛ بیرە ≡ أبجو

**مزرەسێو** / mizresêw/: ناو. سێوی ترش ≡ سیب تُرش

**مزرەق** / mizreq/: ☜ **مزراق**

**مزرەقی** / mizreqî/: ناوەڵکار. *[مەجازی]* لە سەر یەک و بێ ماوەدان ≡ متوالی

**مزرەقێن** / mizreqên/: ☜ **مزراقێن**

**مزرەکە** / mizreke/: ☜ **مزراویلکە**

**مزرەمەنی** / mizremenî/: (!) ناو. ١. بەرێ دار و دەوەنی گوڵداری تایبەت بە ناوچەگەلی فێنک و شێدار یان گەرم، بە گوڵی بۆنخۆش و گەڵای بریقەدارەوە ٢. بەری ئەم دارانە، کە بە گشتی خڕیلە و گۆشتن و ئاودارن، ناوکەیان هەیە و دەخورێن (وەک: پرتەقاڵ، لیمۆ، نارنج و نارنگی و ...) ≡ ١و٢. مُرکبات

**مزرێح** / mizrêĥ/: ☜ **مزراق**

**مزگ** / mizig/: ناو. ١. ☜ **مزگەوت** ٢. ☜ **مزگان**

**مزگاڵ** / mizgal/: ناو. خڕکەبەرد ≡ قلوەسنگ

**مزگان** / mizgan/: ناو. پەرسگە؛ پرێسگا؛ دێوەڵ؛ مزگ؛ هورمزگ؛ نیازگا؛ جێگەی لە خوا پاڕانەوە، بەتایبەت جگە لە هی موسوڵمانان ≡ معبد

**مزگانا** / mizgana/: ☜ **مزگێنی**

**مزگانی** / mizganî/: ☜ **مزگێنی**

**مزگت** / mizgit/: ☜ **مزگەوت**

**مزگەت** / mizget/: ☜ **مزگەوت**

**مزگەر** / mizger/: ناو. ١. ئوستای قاپ و قاچاغ سپی کردنەوە ٢. ☜ **مسگەر** ≡ ١. سفیدگر ٢. ☜ **مسگەر**

**مزگەفت** / mizgeft/: ☜ **مزگەوت**

**مزگەڤت** / mizgevt/: ☜ **مزگەوت**

**مزگەوت** / mizgewt/: ناو. مزگ؛ مزگت؛ مزگەت؛ مەزگت؛ مزگەفت؛ مزگەڤت؛ مزگی؛ مزێت؛ مزیت؛ مەچت؛ مەچچت؛ مەچیت؛ مێژگە؛ نڤێژگە؛ نوێژدان؛ نوێژگە؛ نمینگە؛ مەچێ؛ پەرستگەی موسڵمانان، پتر وەکوو ماڵێکی سەرگیراو بە میحرابێک ڕوو لە کەعبە و گومەز و منارەوە ‹بنچینەی مزگەوت نیشتۆتە ناو چەم/ ڕوو بەرەو قیبلە پشت لە جەهەنەم «گۆران»› ≡ مسجد

**مزگی** / mizgî/: ☜ **مزگەوت**

**مزگین** / mizgîn/: ☜ **مزگێنی**

**مزگێنی** / mizgênî/: ناو. مزگانی؛ مزگین؛ مزانی؛ مزیانی؛ مزگانا؛ مژدانە؛ مژدانی؛ مژدە؛ مژدیان؛ شادیانە؛ نوخشانە: ١. دەسخۆشانە؛ نوقڵانە؛ شیرانی؛ نێد؛ نران؛ چاوڕوونی؛ چاوڕۆشنی؛

شیرینی ڕووداوی دڵخۆشکەر ٢. خەبەری خۆش ‹مزگێنی دا بە سروە بای بەهاری/ وا هاتەوە نەورۆزی کوردەواری «هەژار، بۆکوردستان»› ☰ ١. مُژدگانی ٢. مُژده

**مزگێنیدەر** / mizgênîder/: ئاوەڵناو. مزانیدەر؛ مژدانەهێن؛ هێنەری هەواڵی خۆش ☰ مُبشر

**مزڵ** / m(i)ził/: ☜ **مەنزڵ**

**مزڵشەڕ** / m(i)ziłşeř/: ئاوەڵناو. نەووەت؛ نامەد ☰ نکبت

**مزڵگە** / m(i)ziłge/: ☜ **مەنزڵگا**

**مزمزاندن** / mizm(i)zandin/: چاوگ. وە بزە هێنان ☰ به تبسم واداشتن

**مزمزین** / mizm(i)zîn/: چاوگ. زەردەخەنە کردن ☰ تبسم کردن

**مزور**[1] / m(i)zur/: ناو. خزمەتکار ☰ نوکر

**مزور**[2]: ئاوەڵناو. بەتاقەت و قەوەت ☰ نیرومند

**مزوک** / m(i)zuk/: ☜ **مارمێلکە**

**مزوکڵە** / m(i)zukłe/: ناو. جانەوەرێکە لە ئاودا دەژی وەک سەرمازەڵە دەچێ ☰ جانوری آبزی شبیه چلپاسه

**مزۆدک** / m(i)zodik/: ناو. سەربار؛ زێدەبار ☰ اضافەبار

**مزوور** / m(i)zûr/: ناو. مونزر؛ مونزور؛ خزمەتکاری بەکرێ ☰ خدمتکار روزمزد

**مزووک** / m(i)zûk/: ئاوەڵناو. نەزۆک؛ قسر ☰ نازا؛ سترون

**مزە** / m(i)ze/: ناو. ١. ☜ **مز**[1]**ـ١** ٢. مزئاش؛ ئاردەمزی ئاشەوان ‹دڵم وەک ئاش و دەردم ئاشەوان و بۆ مزەی میحنەت/ سروشکی دەمدەمی چاوم بە سەیلی چەم نەکەم چ بکەم «ناری»› ٣. کار و ڕەوتی جوونەوە و دووپاتە کردنەوەی نابەجێی قسە ☰ ١. ☜ **مز**[1]**ـ١** ٢. مُزد آسیابان از غلّه ٣. تکرار بی‌مورد سخن

⊡ **مزە گرتن:** مزە ساندنی ئاشەوان لە ئاشێڕ ☰ مُزد آسیاب گرفتن از مشتری

**مزەخت** / m(i)zext/: ناو. خەرج ☰ خرج

**مزەر** / m(i)zer/: ناو. ئاوجۆ؛ ئابجۆ ☰ آبجو

**مزەڕەت** / m(i)zeřet/: ناو. بەلا؛ چۆرتم؛ بەسەرهاتی ناخۆش ‹بێ مەزەڕەت گەیشتنە بەرێ› ☰ آسیب

**مزەلق** / m(i)zeliq/: ئاوەڵناو. چەسپاو؛ لکاو؛ لکیاگ ☰ چسبیده

**مزەمز** / m(i)zemiz/: ناو. منجەمنج؛ کار و ڕەوتی جوونەوەی قسە و درەنگ دەربڕینی ‹کاری سیاسی لە ئەمڕۆدا بە مزەمز و گغەگغ ناکرێ› ☰ ژاژخایی

**مزەمزکەر** / m(i)zemizker/: ئاوەڵناو. ڕیوەڕیوکەر؛ درێژدادڕ؛ هەرزەگۆ ☰ ژاژخا

**مزەور**[1] / m(i)zewir/: ناو. قوماربازێ کە قوماری سێپەڕ دەکا ☰ قماربازی که با سه کارت بازی کند

**مزەور**[2]: ئاوەڵناو. ١. فێڵباز؛ گزیکار ٢. دووڕوو؛ ڕیاکار ☰ ١و٢. مزوّر

**مزەورە** / m(i)zew(i)re/: ☜ **مزراویلکە**

**مزەوەن** / m(i)zewen/: ئاوەڵناو. گیرەوە؛ گیرخواردوو ☰ گرفتار

**مزی** / m(i)zî/: ☜ **مزبەر**

**مزیار** / mizyar/: ☜ **مزبەر**

**مزیانی** / mizyanî/: ☜ **مزگێنی**

**مزیت** / m(i)zît/: ☜ **مزگەوت**

**مزیچ** / m(i)zîc/: ☜ **مژن**

**مزیڕ** / m(i)zîř/: ئاوەڵناو. مزێڕ؛ زیاندەر. هەروەها: مزیری ☰ موذی؛ آسیب‌رسان

**مزێت** / m(i)zêt/: ☜ **مزگەوت**

**مزێڕ** / m(i)zêř/: ☜ **مزیڕ**

**مژ**[1] / mij/: ناو. ١. مۆژ؛ تەم؛ دومان ‹مژێکی خەست ناو ڕێگای گرتبوو› ٢. ملک؛ مرێس ‹مژێ

شیر› ٣. کاری هەڵلووشان ‹مژێ جگەرە› ٤. مـژ؛ مزە؛ حەقـدەس ٥. جـۆرێ مێـرووی وردیلـە ٦. نەخۆشیەکی چاوە کە تـەم دەگـرێ ☰ ١. مـە ٢. مُک ٣. پُک ۴. مُزد ۵. نوعی حشـرەی ریـز ۶ نـوعی بیماری چشم

☐ **مژ لێ دان:** ١. مژین ‹مژ لە گوانی دایکـی نـادا!› ٢. هەڵلووشین ‹مژێکی دا لە جگەرەکەی› ☰ ١. مکیدن ٢. پُک زدن

▪ **مژ**[٢]: پاشەوشە. مژەر؛ بمژ ‹خوێنمژ؛ مەمکمـژ› ☰ ـ کام؛ ـ خوار

**مژا** / m(i)ja/: ناو. برژانگ ☰ مُژه

**مژاد** / m(i)jad/: ناو. درگە؛ مەبەست بۆ لێ دوان و لە سەر نووسین ☰ سوژه

**مژان**[١] / m(i)jan/: ☜ **مژین**

**مژان**[٢]: ناو. ١. ☜ **مژانە** ٢. ☜ **مژانگ**

**مژاندن** / m(i)jandin/: چاوگ. دەمـی بێچـوو بـۆ گوانی دایک بردن تا شیر بخوا ☰ بچه را وادار بـه مکیدن کردن

**مژانگ** / m(i)jang/: ناو. مژان؛ برژانگ ☰ مُژه

**مژانە** / m(i)jane/: ناو. مژان؛ دارێکە لـە ئـامووردا ☰ چوبی در خیش

**مژاو** / m(i)jaw/: ☜ **مژتراو**

**مژتـراو** / mijt(i)raw/: ئاوەڵـناو. مـژاو؛ مژیـاگ ☰ مکیده شده

**مژتن** / mijtin/: ☜ **مژین**

**مژتوک** / mijtuk/: نـاو. باسک؛ دەمنـە؛ دارجگـەرە ☰ چوب سیگار

**مژد** / mijd/: ☜ **مژن**

**مژدانە** / mijdane/: ☜ **مزگێنی**

**مژدانەهێن** / mijdanehên/: ☜ **مژدەهێن**

**مژدانی** / mijdanî/: ☜ **مزگێنی**

**مژدە** / mijde/: ☜ **مزگێنی**

**مژدەدەر** / mijdeder/: ☜ **مژدەهێن**

**مـژدەهـێن** / mijdehên/: ئاوەڵـناو. مـژدەدەر؛ مژدانەهێن؛ خۆش‌خەبەر؛ مژدەدەر؛ بەمزگێنی ☰ خوش‌خبر

**مژدی** / mijdî/: ناو. بێزوو؛ بێزگ؛ مەگیرانی ☰ ویار

**مژدیان** / mijd(i)yan/: ☜ **مزگێنی**

**مژران** / mijran/: چـاوگ. تێنەپەڕ. نادیـار //مـژرای؛ دەمژرێ؛ بمژرێ// مژتران؛ مژیان؛ لێ‌هەڵلووشران ☰ مکیده شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: مژراو/ چاوگی نەرێنی: نەمژران

**مژراو** / mijraw/: ئاوەڵناو. مەختە؛ مریسی ☰ مکیده

**مژگ** / m(i)jig/: ☜ **مێشک-١**

**مژلۆر** / mijlor/: ☜ **مێروولە**

**مژلۆک** / mijlok/: ☜ **مێروولە**

**مژلەور** / mijlewir/: ☜ **مێروولە**

**مژ ـ مژ** / mij mij/: ناو. ١. مژی زۆر ٢. ترووکـەی چاو ☰ ١. مُک پیاپی ٢. پرش پلک

**مژمژ** / mijmij/: نـاو. قەیسی؛ شێلانی؛ شـێلانە ☰ زردآلو

**مژمژانـــدن** / mijm(i)jandin/: چـــاوگ. چـــاو تروکاندنی نائاسایی ☰ پلک زدن غیرعادی

**مژمژۆک** / mijm(i)jok/: نـاو. ١. شـانەی هێشـتا هەنگوین تێ‌نەکراو ٢. گیایەکە گوڵەکەی دەمژن ☰ ١. شانەی خالی از عسل ٢. گیاهی است

**مژمژە** / mijm(i)je/: نـاو. ١. قەیسـی؛ شـەلانی؛ زەردەڵـوو ٢. گـۆزروان؛ گـاوەزوان ٣. جـۆرێ پەپوولە ٤. چەمچەقولە؛ جۆرێک نوقڵـە دەسـکی تێ خراوە و منداڵ دەیمژن ☰ ١. زردآلو ٢. گاوزبان ٣. نوعی پروانه ۴. آب‌نبات چوبی

**مژمژین** / mijm(i)jîn/: چـاوگ. ترووکـەترووک کردنی ناویستەکی چاو ☰ پریدن پلک

**مژمور** / mijmur/: ئاوەڵناو. نیـوە ئاواڵـە؛ نیـوە بـاز؛ نیوە خەواڵوو (بۆ چاو) ☰ نیمه‌باز (چشم)

**مژمۆر** / mijmor/: ئاوەڵناو. پرووشەچاو؛ خووتەکـە؛

چاوچکۆله 🖙 چشم‌کوچک

**مژن** / mijn/: ناو. مژد؛ مزیج؛ بێزوو؛ بێزگ؛ بێـزی؛ مه‌گیرانی 🖙 ویار

**مژن** / mijin/: ئاوه‌ڵناو. مژلێده‌ر؛ ئه‌وی ده‌مـژێ 🖙 مکنده

**مژنانـه** / mijnane/: نـاو. بێزگانـه؛ بێزووانـه؛ ئـه‌و شته‌ی ژنی ئاوس بێزگی پێوه ده‌کا 🖙 ویارانه

**مژوڵ** / m(i)jul/: ئاوه‌ڵناو. خه‌ریک؛ سه‌رگه‌رمی کار 🖙 مشغول

**مژوڵانک** / m(i)julank/: ناو. برژانگ 🖙 مُژه

**مژوڵاهـی** / m(i)julahî/: نـاو. دۆخـی خـه‌ریک بـه‌ کاریک بوون 🖙 مشغلت

**مژولیـاییش** / m(i)julyayîş/: چـاوگ. وتـار دان؛ قسه بۆ خه‌ڵک کردن 🖙 سُخنرانی کردن

**مژومۆر** / m(i)j û mor/: ناو. ته‌م‌ومژ؛ تـه‌پ‌ومـژ 🖙 مه و غبار

**مژوی** / mijwî/: 🖘 مه‌رژی

**مژوێ** / mijwê/: 🖘 مه‌رژی

**مژۆک**[1] / m(i)jok/: 🖘 مژه‌نه

**مژۆک**[2]: ئاوه‌ڵـناو. تایبه‌تمه‌نـدی بێچوویـێ کـه زۆر خێ داوه‌ته مه‌مکی دایکی 🖙 آویزان سینه‌ی مادر

**مژۆڵ** / m(i)joł/: ناو. مژۆڵک؛ برژانگ 🖙 مُژه

**مژۆڵک** / m(i)jołik/: 🖘 مژۆڵ

**مـژو** / m(i)jû/: ئاوه‌ڵـناو. ۱. وروره؛ مزه‌مزکـه‌ر ۲. برش‌هێناو؛ کۆنی برشاوی 🖙 ۱. ژاژخا ۲. کپک‌زده

**مژویلی** / m(i)jûylî/: ناو. گیایه‌که 🖙 گیاهی است

**مژه**[1] / m(i)je/: ناو. مژۆڵک؛ برژانگ 🖙 مُژه

**. مژه**[2]: پاشه‌وشه. ـ مژ؛ مژه‌ر ‹مه‌مک‌مژه› 🖙 مکنده

**مژه‌ک** / m(i)jek/: 🖘 مژه‌نه

**مژه‌نه** / m(i)jene/: نـاو. مژۆک؛ مژه‌ک؛ قاغه‌ز یان په‌ڕۆیـه‌ک کـه لـه‌سـه‌ر دڵـۆپی داده‌نـێن بـۆ هه‌ڵمژینی 🖙 خشک‌کن

**مژه‌و** / m(i)jew/: 🖘 برژانگ

**مژی** / m(i)jî/: 🖘 مێشک‌ـ۱

**مژیلانک** / m(i)jîlanik/: ناو. برژانگ؛ مژۆڵ 🖙 مُژه

**مژین** / m(i)jîn/: چاوگ. تێپه‌ڕ. //مژیـت؛ ده‌مـژی؛ بمژه// مژان؛ مژتن؛ مشتن؛ میتن؛ مێتن؛ مێـژان؛ مێـژتن؛ مێـژین؛ مێشـتن؛ مـێهتن؛ ملـکنای؛ ملۆسنایش: ۱. مریستن؛ هل خوارن؛ ڕاکێشانی شتێ بۆ زار بـه هێـزی ملـک دان ‹ئـه‌و که‌سـه‌ی بمـژێ خوونـاوه‌ی گـه‌رده‌نێ/ کـوفره یـه‌ک قـه‌تره شه‌رابی گه‌ر ده‌نێ «هێمن»› ۲. خواردنه‌وه؛ قـووت دانی تراو 🖙 ۱. مکیدن ۲. نوشیدن

■ ئاوه‌ڵناوی به‌رکاری: ـ/ چاوگی نه‌رێنی: نه‌مژین

**مژیـوه‌ر** / m(i)jîwer/: نـاو. مژیـوه‌رد؛ میـژوه‌رد؛ مێژوه‌رد؛ مێژۆرد؛ میـژوه‌ردی؛ مێـوژۆرد؛ زیزانـه؛ زیزان؛ گیایێکی ده‌شته‌کی به ده‌نکێکی خڕ و ورد و زۆر ڕه‌قه‌وه که له ناو نیسک و نۆک و ده‌غـڵ و داندا ده‌ڕوێ 🖙 گیاهی است

**مژیوه‌رد** / m(i)jîwerd/: 🖘 مژیوه‌ر

**. مژێن** / m(i)jên-/: پاشه‌وشه. مـژ پـێ ده‌ر 🖙 وادار کننده به مکیدن

**مس**[1] / mis/: ناو. ۱. مـه‌س؛ پـاقر؛ پـاخر؛ تـوخمی کیمیایی کانزایی به ژماره‌ی ئه‌تومی ۲۹ و کێشی ئه‌تومی ٦٣،٥٤، به ڕه‌نگی سووری ئاماڵ نـارنجی که له ئاودا ناتوێته‌وه و له پیشه‌سـازیدا ده‌وریکـی زۆری هه‌یـه و ده‌فـر و ئامرازیشـی لـێ دروسـت ده‌که‌ن ۲. فامین؛ دۆخی تێگه‌یشـتن 🖙 ۱. مـس ۲. تحویل سخن

**مس**[2]: ئاوه‌ڵـناو. گوێ به‌خاڵ و په‌ڵـه ـ په‌ڵـه (بـزن) ‹وه‌ک گیسکی مس له به‌هارا/ بن کلکیـان ده‌کـه‌ین به دارا «هه‌ژار، *بۆ کوردستان*»› 🖙 گوش خالخالی (بُز)

**مساب** / m(i)sab/: نـاو. قالبه که‌وش لـه ئاسـن 🖙 قالب فلزی کفش

**مساخ** / m(i)sax/: نـاو. مساخه؛ ئارداوێژی به‌رداش 🖙 بخشی از آسیاب

**مساخه** / m(i)saxe/: ☜ **مساخ**

**مساس** / m(i)sas/: ☜ **مەساسە**

**مساسک** / m(i)sasik/: ☜ **مەساسە**

**مساسه** / m(i)sase/: ☜ **مەساسە**

**مسافر** / m(i)safir/: ناو. ڕێبوار؛ ڕێوار؛ ڕێبگار؛ ڕێوگار؛ ڕابگار؛ ڕاویار؛ ڕێبار؛ گەشتیار؛ کارداک: ١. ئەو کەسەی بۆ شوێنێ بەڕێوەیە ٢. ئەوەی بڕیارە بچێ بۆ سەفەر ‹تۆ بەیانی مسافری، ئەمشەو زووتر بنووا› ⇐ ١و٢. مسافر

**مسافرخانه** / m(i)safirxane/: ناو. جێی حەسانەوە و نووستنی مسافر ‹لە کابرایەکم پرسی: مسافرخانە لە کوێیە؟ بانگی کردمە لاوە گوتی: بلێ هوتێل؛ مسافرخانە قاچاغە! «هەژار، چێشتی مجێور»› ⇐ مسافرخانه

**مسافرەت** / m(i)saf(i)ret/: ناو. سەفەر؛ کار و ڕەوتی چوونە سەفەر ⇐ مسافرت

**مسای** / m(i)say/: چاوگ. فامان؛ فێر بوون ⇐ آموختن

**مسایه** / m(i)saye/: ☜ **مسایش**

**مسایەنه** / m(i)sayene/: چاوگ. بوونە شاگرد بۆ فێر بوون ⇐ مُحصل شدن

**مسایش** / m(i)sayîş/: چاوگ. مسایە: ١. تێگەیشتن ٢. فێر بوون ⇐ ١. درک کردن ٢. آموختن

**مست** / mist/: ناو. مشت: ١. گولم؛ نوچک؛ نونجک؛ نوونجگ؛ گوڕمیچ؛ گورمچ؛ گوڕمۆچ؛ گوڕمچە؛ گورمێچە؛ فووت؛ مستەکۆڵە؛ گورمشت؛ پەنجەی لێکنراو؛ دەستی قووجاو ‹پێنج ئەنگوست دەبنە یەک مست! «هەژار»› ٢. سیخورمە؛ سوخورمە؛ سخلمە؛ سقلمە؛ گۆمرچە؛ گۆڕمچە؛ گورمشت؛ مشتە؛ گرمست؛ مستەکۆلە؛ مشتەکۆلە؛ کۆل؛ دنگ؛ گوڕمیچ؛ گوڕمچ؛ گورمێچە؛ گورمیچە؛ گولم؛ گولەمە؛ گوڕمشت ‹مستێکی تێ سرەواند!› ٣. لاوێچ؛ لەوێچ؛ لاگوێل؛ لالۆچ؛ ویچ؛ لاگوول؛ گوێل؛ گوێلم؛ ئەوەندە لە شت کە لە چالایی نێوان لەپی یەک دەست و قامکاندا جێی دەبێتەوە ‹مستێک برینج› ٤. وێچ؛ دوولەوێچ؛ دوولاگوێل؛ ئەوەندە لە شت کە لە چالایی نێوان لەپی دوو دەستدا جێی ببێتەوە ‹دوو مست لەو کانییە ئاو بخۆوە!› ⇐ ١تا٤. مُشت

▣ **مست گرتنەوە**: مشت گرتن؛ مشت گرتنەوە؛ مشت لێ گرتن؛ دەست ڕاگرتن بۆ تێکردنی شتێ ⇐ دست گرفتن برای چیزی

**مست لێ داگرتن**: مشت لێ داگرتن؛ پڕ بە چنگ لە شتێ هەڵگرتن ⇐ پُر یک مُشت از چیزی برداشتن

**مست لێدان**: مشت لێ دان؛ بە چنگی قووچاو لە شتێ دان ⇐ مُشت زدن

**کەوتنە مستەوە**: کەوتنە نێو مشت ⇐ در دست افتادن

**لە مستدا بوون**: لە مشتدا بوون؛ لە چنگدا بوون؛ بە تەواوی لە بەر دەستدا بوون ⇐ در مُشت خود داشتن

**هاتنە نێو مست**: کەوتنە بەردەستەوە ⇐ بە چنگ آمدن

**مستاخ** / mistax/: ☜ **مشتاخ**

**مستانی** / mistanî/: ناو. بوکس؛ مستەکۆلان؛ مشتەکۆلانی ⇐ بوکس

**مستبا** / mistba/: ناو. شوورەی دەوری باخ ⇐ دیوار پیرامون باغ

**مستقوچاو** / mistqûçaw/: ئاوەڵناو. [کنایە] ڕژد و ڕەزیل؛ دەستقووچاو ⇐ خسیس

**مستنایش** / mistnayîş/: ☜ **مسنایەنه**

**مسته** / miste/: ناو. پەنجەکێش؛ جۆرێ کولێرە ⇐ نوعی نان گرده

**مستەحەق** / misteĥeq/: ئاوەڵناو. ١. شیاوی خێر

پێ‌کردن ٢. شیاوی جزیا دان ☰ ١و٢. مُستحق

**مسته‌راو** / misteraw/: ☜ **مه‌سته‌راح**

**مسته‌کۆڵان** / mistekołan/: ناو. مستانی؛ بوکس؛ مشته‌کۆلانی ☰ بوکس

**مسته‌کۆڵه** / mistekołe/: ناو. مشته‌کۆڵ؛ مشته‌کۆڵه؛ کوڵه‌مست؛ کوڵه‌مشت: ١. سیخوڕمه ٢. په‌نجه‌ی قووچاو ☰ ١. سقلمبه ٢. مُشت گره کرده

**مسحه‌ف** / misĥef/: ناو. مسعه‌ف؛ مه‌سحه‌ف: ١. قورئان ٢. کتێبی چکۆله ☰ ١. قرآن ٢. کتابچه

▣ **مسحه‌فا ڕه‌ش**: کتێبی هه‌ره پیرۆزی ئێزدیان ☰ کتاب مقدس ایزیدیان

**مسدان** / misdan/: چاوگ. توند ده‌ست پێدا هێنان ☰ با فشار دست مالیدن

**مسرانی** / misranî/: ناو. داری درێژی به کون و ئاڵقه بۆ به‌ستنه‌وه‌ی ده‌واران ☰ کُنده‌ی با سوراخ و حلقه برای بستن چادر

**مسری** / misrî/: ناوه‌ڵناو. لاواز و ڕه‌قه‌ڵه‌ی بالابه‌رز (ژن) ☰ لاغر قد بلند (زن)

**مسعه‌ف** / mis'ef/: ☜ **مسحه‌ف**

**مسقاڵ**[1] / misqał/: ناو. یه‌که‌ی کێشی کۆن به قه‌د ٤,٥ گره‌م ☰ مثقال

**مسقاڵ**[2]: ناوه‌ڵکار. *[کینایه]* تۆزقاڵ؛ تۆز؛ هێندێکی زۆر که‌م (مسقاڵێک نانی پێ نه‌داین!) ☰ اندک

**مسقاڵه‌زه‌ڕه** / misqałezeře/: ناوه‌ڵکار. تۆزقاڵه؛ مسقاڵی‌زه‌ڕه (مسقاله‌زه‌ڕه فه‌رقیان نییه) ☰ یک ذرّه

**مسقاڵی** / misqałî/: ناو. ١. متقاڵ؛ جۆرێ خامی سپی ٢. جۆرێ پارچه‌ی زه‌ڕی ☰ ١. متقال ٢. نوعی پارچه‌ی زری

**مسقاڵی‌زه‌ڕه** / misqałîzeře/: ☜ **مسقاڵه‌زه‌ڕه**

**مسک** / misk/: ناو. مشک؛ میشک؛ میسک؛ ڕۆنێکی بۆنخۆش به ڕه‌نگی قاوه‌یی و تامی تاڵه‌وه که له نێو تووره‌که‌یه‌ک له پاڵ ئه‌ندامی زاوزێی نێره‌ئاسکی میسکیدایه و له عه‌ترسازیدا به که‌ڵک دێ ☰ مُشک

**مسکه** / miske/: ناو. میسکه؛ جۆرێ کلۆ ☰ نوعی ملخ

**مسکی** / miskî/: ناو. ١. لیمۆی ترش ٢. جۆرێ ترێ ☰ ١. لیموترش ٢. نوعی انگور

**مسکێن** / miskên/: ناو. ڕایه‌ت؛ ڕه‌عیه‌ت؛ به‌ر حوکمی ئاغا ☰ رعیّت

**مسگه‌ر** / misger/: ناو. مزگه‌ر؛ مه‌سکه‌ر؛ قه‌زانچی؛ به‌رۆش‌ساز؛ پاخرکه‌ر؛ که‌سێ که که‌ره‌سه و ده‌فری مسین چێ ده‌کا و سه‌روکاری ده‌گه‌ڵ قاپ و قاچاخی مسیدایه ☰ مسگر

**مسڵمان** / m(i)siłman/: ☜ **موسوڵمان**

**مسمار** / mismar/: ☜ **مێخچه**

**مسمتاندن** / mism(i)tandin/: چاوگ. داخستن؛ کپ کردن؛ به‌ستن ☰ مسدود کردن

**مسمد** / mismid/: ناو. ١. کار و ڕه‌وتی به‌ر لێ‌گرتن؛ داخستن ٢. شێوێکه له گۆشت و ته‌ڕه‌پیاز و کاهوو ☰ ١. عمل بستن ٢. غذایی است

**مسناینه** / misnayne/: چاوگ. مسناییش؛ مستناییش: ١. شان دان؛ نیشان دان ٢. فێر کردن؛ ڕاهێنان ☰ ١. نشان دادن ٢. یاد دادن

**مسناییش** / misnayîş/: ☜ **مسناینه**

**مسوار** / miswar/: ناو. کانزایه‌که له مس و شتی‌تر، سه‌ماوه‌ری لێ ده‌کرێ ☰ مسوار؛ آلیاژی است

**مسواک** / miswak/: ناو. میسواک؛ برۆسی تایبه‌تی بۆ ددان شۆردن ☰ مسواک

**مسوڵدان** / misułdan/: ☜ **مێزه‌ڵدان**

**مسوده** / miswede/: ناو. پێش‌نووس؛ ڕه‌ش‌نووس ☰ پیش‌نویس

**مسۆده** / m(i)sode/: ناو. به‌لا؛ چۆرتم؛ مسیبه‌ت ☰ بلا و مُصیبت

**مسۆگه‌ر** / m(i)soger/: ناوه‌ڵناو. مسه‌وگه‌ر؛ بێ

شک؛ بێ قسەوباس؛ دڵنیا (لە بوون یان ڕوودانی شتێک) ‹لە سیاسەتدا هیچ ئاکامێ مسۆگەر نییە› ☲ مُسلّم؛ تضمینی

⊡ **مسۆگەر بون:** مسەوگەر بوون؛ شک تێدا نەمان ☲ مُسلّم بودن

**مسۆگەر کردن:** دەستەبەر کردن ‹هاودەنگی سەر کەوتن مسۆگەر دەکا› ☲ تضمین کردن

**مسۆگەری / m(i)sogerî/:** ناو. مسەوگەری؛ دۆخ یان چۆنیەتی مسۆگەر بوون ☲ حتمیّت؛ تضمین

**مسەبا / m(i)seba/:** ناو. سەبر؛ مۆڵەت ‹مسەبایەکم لێ بگرە جارێ کارم زۆرە› ☲ صبر

**مسەمس / m(i)semis/:** ئاوەڵکار. خنەخن؛ زۆر بە هێواشی و لەسەرخۆ ‹ئەوە مسەمس خەریکی چیت؟ زووبە! درەنگە› ☲ بە کُندی

**مسەور / m(i)sewir/:** ناو. ڕاوێژ؛ تەگبیر ☲ مشاورە

**مسەوگەر / m(i)sewger/:** ☜ **مسۆگەر**

⊡ **مسەوگەر بون:** ☜ **مسۆگەر بون**

**مسەوگەری / m(i)sewgerî/:** ☜ **مسۆگەری**

**مسەیت / m(i)seyt/:** ناو. دەنکەترێی وشک لە ناو هێشووی هێشتا نەچنراودا ☲ دانەی خشک انگور در خوشەی درختی

**مسی / m(i)sî/:** ئاوەڵناو. ۱. مسین؛ چێ کراو لە مس ۲. بە ڕەنگی سووری ئاماڵ زەرد و بریکەدار ☲ ۱. مسین ۲. مسی رنگ

**مسیبەت / m(i)sîbet/:** ناو. ۱. بەلا و بەسەرهاتی خراپ ۲. *[مەجازی]* بنیادەمی تووش و بزۆز ☲ ۱. مُصیبت ۲. آدم ناآرام و خطرناک

**مسین / m(i)sîn/:** ئاوەڵناو. مسی؛ لە پاقر چێ بوو ‹تاوەی مسین› ☲ مسین

**مسینک / misînik/:** ☜ **مسینە**

**مسینە / m(i)sîne/:** ناو. مەسین؛ مەسینە؛ مسینک؛ ئافتاوە؛ لوولێنەی لە مس ☲ آفتابەی مسین

**مسیوەتی**[1] **/ m(i)sîwetî/:** ناو. دەرد و ڕەنج ☲ مُصیبت

**مسیوەتی**[2]**:** ئاوەڵناو. ۱. زەحمەتکێش ۲. تازیەبار؛ ئازیەتبار ☲ ۱. زحمتکش ۲. سوگوار

**مش / miş/:** دەنگەناو. مخ؛ دەنگی لووت ☲ فین

⊡ **مش کردن:** فم/ هنگ/ شم/ خم کردن؛ لووت سڕین ☲ فین کردن

**مشا / m(i)şa/:** ئاوەڵناو. دابەش نەکراو لە ناو شەریکاندا ☲ مُشاع

**مشار / m(i)şar/:** ناو. هەرە؛ ئامرازی ددانەداری دار بڕینەوە ☲ ارّە

**مشاراوا / m(i)şarawa/:** ناو. کار و ڕەوتی ئاو دانی ڕەز لە خاکەلێوە و بانەمەڕدا ☲ عمل آب دادن تاکستان در فروردین و اُردیبهشت

**مشارە**[1] **/ m(i)şare/:** ناو. ۱. پێوانەیەک لە زەمینی کێلان ۲. جۆرێ ماسی کە ددانێکی درێژی برگە-برگەی هەیە ☲ ۱. مساحتی از زمین زیر کشت ۲. ارّەماهی

**مشارە**[2]**:** ئاوەڵناو. ددانەدار ☲ دندانەدار

**مشاگ / m(i)şag/:** ناو. ڕەنجبەری ڕۆژبەڕۆژ؛ کرێکاری ڕۆژانە لە مەزرادا ☲ کارگر روزمزد در مزرعە

**مشاندن / m(i)şandin/:** چاوگ. مشانن؛ دەنگی هەناسە لە لووتەوە دەرچوون ☲ نفس دادن از بینی

**مشانن / m(i)şanin/:** ☜ **مشاندن**

**مشانە / m(i)şane/:** ناو. مژانە؛ ئامرازێکە لە نیر و ئامووردا ☲ ابزاری در خیش

**مشایخ / m(i)şayix/:** ☜ **مشایەخ**

**مشایەخ / m(i)şayex/:** ناو. مشایخ؛ کۆمەڵە شێخ ☲ مشایخ

**مشت**[1] **/ mişt/:** ناو. ۱. ☜ **مست** ۲. محانج؛ کاری خستن بەبێ ئامانج ۳. گێرەوکێشە ☲ ۱. ☜ **مست** ۲. پرتاب بدون هدف ۳. جدال

⊡ **مشت گرتن:** ☜ **مست گرتنەوە**

**مشت گرتنەوە:** ☜ **مست گرتنەوە**

**مشت لێداگرتن:** ☜ **مست لێداگرتن**

**مشت لێدان:** ☜ **مست لێدان**

**مشت لێ گرتن:** ۱. ☜ **مست گرتنەوە** ۲. قەرەوڵ گرتن ‹بە سووک نەوی لە تفەنگ/ مشتی لێ گرت بەبێ دەنگ «قانع»› ≡ ۱. ☜ **مست گرتنەوە** ۲. نشانه گرفتن

**مشت**[۲]: ئاوەڵناو. لیپ؛ لێوانلێو؛ لێواولێو ≡ لبالب

⊡ **مشت کردن:** پڕ کردن ≡ پُر کردن

**مشتا** / mişta/: ☜ **مشتاخ**

**مشتاخ** / miştax/: ناو. مشتا؛ مشتاخە؛ مەشتا؛ مستاخ؛ جێگەی هەڵخستنی میوە بۆ وشک بوون ≡ جای در آفتاب گذاشتن میوه

⊡ **مشتاخ نانەوە:** ترێ لە بەر تاو هەڵخستن بۆ وشک بوونەوە ≡ انگور در آفتاب پهن کردن

**مشتاخان** / miştaxan/: ناو. خەرمانان؛ مانگی شەشەمی ساڵ ≡ شهریور

**مشتاخە** / miştaxe/: ☜ **مشتاخ**

**مشتاغ** / miştağ/: ناو. ساناڵە؛ وەرەزەن؛ مەشتا؛ شوێنی هەڵخستنی میوە ≡ جای خشک کردن میوه در آفتاب

**مشتاق**[۱] / miştaq/: ئاوەڵناو. تامەزرۆ؛ بەتاسە؛ ئارەزوومەن ≡ مُشتاق

**مشتاق**[۲]: پێرۆ. ← **دەس‌ومشتاق**

**مشتاک** / miştak/: ناو. دەپی ئارد ماڵین لە دەوری بەرداش ≡ تختەی آردروبی پیرامون سنگ آسیا

**مشتاو** / miştaw/: ☜ **مشتەگان**

**مشتن** / miştin/: چاوگ. ۱. ☜ **مژین** ۲. ماڵین؛ ڕماڵین ≡ ۱. ☜ **مژین** ۲. روبیدن

**مشتودرەوش** / mist û d(i)rewş/: ناو. [کینایە] شەڕی نێوان بەهێز و بێ‌هێز ≡ کنایه از نبرد نابرابر

**مشتوماڵ** / mist û mał/: ناو. ۱. ساو؛ کار و ڕەوتی خاوێن کردنەوە و بریقەدار کردنی شتێ ۲. کاری ماڵین ‹مشتوماڵی دەوێ ئاوێنەیی ژەنگاوی خەیاڵ/ مەست و گێژم کە هەتا گاڵە بە جامی جەم کەم «هێمن»› ≡ ۱. صیقل ۲. ماساژ

⊡ **مشتوماڵ دان:** ۱. شێلان ۲. [کینایە] پیس لێ دان؛ تاشاندن ۳. ساو دان ≡ ۱. ماساژ دادن ۲. کتک زدن مُفصل ۳. صیقل دادن

**مشتوماڵدراو** / mişt û mald(i)raw/: ئاوەڵناو. پەرداخ ≡ جلاداده شده

**مشتوماڵکراو** / mişt û małk(i)raw/: ناو. ماڵدراو ≡ مالیده

**مشتومڕ** / mist û miř/: ناو. مڕومشت؛ ململانێ؛ کێشە و دەم‌بەدەمە؛ شەڕ ‹ئەستێرە و مانگ و ڕۆژ لە عاسمانانن/ هۆی گێچەڵ و مشتومڕی زانایانن «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ≡ جدال

**مشتوەشێن** / miştweşên/: ناو. گۆڵەمەباز ≡ بوکسور

**مشتو** / mistû/: ناو. مشتە؛ دەسکی خەنجەر و کێرد ‹دەسەسڕی ئاڵ، لفکەی بەرکەمەر/ سووچی دەسەسڕ، سەر مشتووی خەنجەر «قانع»› ≡ دستەی خنجر و کارد

**مشتوک** / miştûk/: ناو. بەرچەق؛ پێشەنگی گۆبەند دەستە خەنجێر و شمشێر ≡ دستەی خنجر و شمشیر

**مشتە** / mişte/: ناو. ۱. ئامرازی پێ کوتانی کلاشکەر و پینەچی ‹مشتە بۆ دۆم و پینەچی دەرزی/ هەم عەلافیش قەپانی کێشانی «قانع»› ۲. کوتکی هەلاجی ۳. ☜ **مشتو** ٤. ☜ **مشتەگان** ≡ ۱. مُشتەی کفاشی ۲. چک پنبەزن ۳. ☜ **مشتو** ۴. ☜ **مشتەگان**

**مشتەری** / mişterî/: ناو. ۱. کڕیار؛ بسێن ‹مشتەری وەک من لە مەیخانێ کەمن/ زۆربەیان شاد و بەکەیف و بێ‌خەمن «هێمن»› ۲. گەورەترین گەڕۆکی کۆمەڵەی ڕۆژ بە دوازدە مانگەوە ≡ ۱. مُشتری؛ خریدار ۲. سیارەی مُشتری

**مشتەکۆڵ** / miştekoł/: ☜ **مستەکۆڵە**

**مشتەکۆڵانی** / miştekołanî/: ناو. مستانی؛ بوکس؛ مستەکۆلان ☳ بوکس

**مشتەکۆڵە** / miştekołe/: ☜ **مستەکۆڵە**

**مشتەگان** / miştegan/: ناو. *[ناشیرین]* مشتاو؛ مشتە؛ جلق؛ دەسپەڕ ☳ جلق؛ استمنا

**مشتەلە** / miştele/: ناو. ١. نەمام؛ ڕیشەی ناژتن ٢. دووکانی شەتلان ☳ ١. نهال ٢. فروشگاه نشا

**مشتیلە** / mistîle/: ناو. دەستەندوو؛ دەستەمستە؛ دەسگیرەی جووتیار لە پاشبارەدا ☳ دستگیرەی خیش

**مشتێ** / miştê/: ☜ **مشتێك**

**مشتێک** / miştêk/: ناوەڵکار. مشتێ؛ کەپێ؛ کەپێک؛ پڕی یەک دەست ‹مشتێک مێوژی دۆلاوی کردە گیرفانمەوە› ☳ پُر یک کف دست

**مشخۆر** / mişxor/: ناو. قەسەڵی ناو ئاخوڕ ☳ پسماندەی علف در آخور

**مشخۆڵزمە** / mişxołz(i)me/: ☜ **مشکوڵۆزمە**

**مشراق** / mişraq/: ناو. ١. نیسکە؛ زەڕەبین ٢. کانوون؛ ناوەندی زەڕەبین کە بەر تاوی ئەدەن ئاگری پێ دەکەنەوە ☳ ١. عدسی ٢. کانون عدسی

**مشقنای** / mişq(i)nay/: چاوگ. پشقاندن؛ جۆرێ دەنگ دەرهێنانی زۆربەی گیانلەران، لە ترسان یا ماندوو بوون ☳ نوعی صدا درآوردن جانداران

**مشقەڵان** / mişqełan/: ☜ **مەشخەڵان**

**مشقەمشق** / mişqemişq/: ناو. *[مەجازی]* دۆخی هەژان و هەڵچوون لە حەیفان؛ بە سۆ بوون؛ داخ هاتن ☳ حالت حسرت خوردن

**مشک** / mişk/: ناو. ١. مڵ؛ ملە؛ مەرە؛ میش؛ مووش؛ مسک؛ موێش؛ موویش؛ گیاندارێکی گوانداری بچووک، بە قەپۆز و کلکی درێژەوە کە گەورە و گچکە و ڕەش و بۆر و سپی هەیە ٢. ☜ **مسک** ☳ ١. موش ٢. ☜ **مسك**

**مشکانە** / mişkane/: ناوەڵناو. *[مەجازی]* فێڵباز و دەسبڕی بە نهێنی ☳ آبزیرکاه

**مشکتەرامشیح** / mişkteramşîĥ/: ناو. گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ ☳ گیاه کاکوتی

**مشکەرۆشک** / mişkkerwêşk/: ناو. مشکەخەزاڵ؛ مشک کەورێشک؛ جانەوەرێکە لە تیرەی سمۆرە، لاقدرێژ و دەستکورت و گوێدرێژە ☳ یربوع؛ موش خرگوش

**مشکەورێشک** / mişkkewrêşk/: ☜ **مشك‌کەروێشك**

**مشکگرە** / mişkg(i)re/: ناو. مشگرە؛ هەڵەکەسەمای گەورە؛ باڵدارێکی ٣٤ سانتیمیتری ڕاوکەرە ☳ دلیجه

**مشکولی** / mişkulî/: ناو. پێڵوو؛ پەلکی چاو ☳ پلک چشم

**مشکوڵ**[١] / mişkuł/: ناو. ئاستەنگی؛کۆست؛ کۆسپ؛ گیروگرفت ☳ مُشکل

**مشکوڵ**[٢]: ناوەڵناو. دژوار؛ ئاستەنگ؛ ئاریشە؛ ئەستەم ☳ سخت

**مشکوڵۆزمە** / mişkułoz(i)me/: ناوەڵناو. مشخۆڵزمە؛ ئۆباڵ بەگەردەن؛ بەرپرسی تاوانی کەسێکی‌تر ☳ مشغول ذمه؛ مدیون

**مشکوڵی** / mişkułî/: ناو. دژواری؛ گرفتاری ☳ اشکال و دشواری

**مشکە** / mişke/: ناوەڵناو. *[کینایە]* کورتەباڵای زیت و چالاک ☳ کوتاه قد زبر و زرنگ

**مشکەخۆرە** / mişkexore/: ناو. ڕاسوو؛ ڕاسۆ؛ ڕاسوولک؛ مشکی خورما؛ گەنکەدەڵەک؛ گیانەوەرێکی گوهانداری گۆشتخۆری پەنجەدارە بە جەستەی درێژ، پێی کورت و پێستی تووکنەوە کە لە کاتی بەرەنگار بوونەوەدا بۆنێکی ناخۆش لە خۆی بەر دەداتەوە ☳ راسو

**مشکەخەزاڵ** / mişkexezał/: ☜ **مشك‌کەورێشك**

**مشکەکوێرە** / mişkek(i)wêre/: ناو. مشکەکۆرە؛ مووشۆکۆر؛ جرجەمشک؛ جرج؛ جۆرێ مشکە لە دەشت دەژی ≡ موش کور

**مشکەکۆرە** / mişkekore/: ☜ **مشکەکوێرە**

**مشکی**¹ / mişkî/: ناو. ١. شەدە؛ ڕەستی؛ جۆرێ پارچەی ئاوریشم کە دەکرێتە پێچی سەر ٢. خۆڵەکەوە؛ خۆڵەمێش؛ بوول ٣. ڕەنگی ڕەش ≡ ١. نوعی دستار ابریشمی ٢. خاکستر ٣. مشکی؛ سیاه

**مشکی**²: ئاوەڵناو. ڕەش؛ سیا؛ سیاو؛ ڕەژ؛ قیری؛ قیرین؛ قەلاخی؛ بە ڕەنگی ڕەش ≡ سیاەرنگ

**مشکیدان** / mişkîdan/: ناو. شوێنی لێ ڕشتنی زبڵ و خۆڵەمێش ≡ محل ریختن زُباله و خاکستر

**مشگرە** / mişg(i)re/: ☜ **مشکگرە**

**مشلاق** / mişlaq/: ئامراز. هەمبەر؛ تەواو بەرانبەر ‹مالا وە مشلاقێ مالا حەسۆیە› ≡ روبرو؛ مُقابل

**مش.مش** / miş miş/: دەنگەناو. خوڕەی ئاوی کەم ≡ شُر ـ شُر

**مشمشاندن** / mişm(i)şandin/: چاوگ. مشەمش کردن؛ وەک مشک لە تاریکیدا گەڕان ≡ کورمال گشتن

**مشمشە** / mişm(i)şe/: ناو. مشە؛ جۆرێ نەخۆشی یەکسم ≡ نوعی بیماری ستور

**مشمشێر** / mişm(i)şêr/: ناو. مشمشێری؛ دار شێلانە؛ دار قەیسی ≡ درخت زردآلو

**مشمشێری** / mişm(i)şêrî/: ☜ **مشمشێر**

**مشن** / m(i)şin/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی کەسێ کە دەنگی هەناسەی لە لووتەوە دێ ≡ هِن هِن کننده

**مشوار** / mişwar/: ئاوەڵناو. خۆڕاگر؛ بەرگەگر ≡ مقاوم

**مشوت** / m(i)şut/: ناو. ١. کاوێژ؛ قاوێچ ٢. بەرماوی خواردەمەنی ≡ ١. نشخوار ٢. پسماندەی خوراک

**مشوور** / m(i)şûr/: ناو. ١. سەلیقەی کار پێکهێنان ‹کار دەبێ بە مشوور و بەرنامەوە بکرێت› ٢. تەگبیر و ڕا ‹دەبێ مشووری لێ بخۆری› ≡ ١. سلیقه ٢. تدبیر

**مشوورخۆر** / m(i)şûrxor/: ناو. مشوورخۆرە؛ سەرپەرست؛ ئاگاداری کار ‹کارەکەرم بمرێ، مشوورخۆرم نەمرێ «مەسەل»› ≡ سرپرست

**مشوورخۆرە** / m(i)şûrxore/: ☜ **مشوورخۆر**

**مشوورخۆری** / m(i)şûrxorî/: ناو. ١. کاری بە تەگبیر خۆ ماندوو کردن بە کەسێ یان بە کارێکەوە ٢. بەڕێوەبەری؛ کارگێڕی ≡ ١. سرپرستی ٢. تدبیر

**مشە**¹ / m(i)şe/: ناو. ١. هەناسە ‹مشەی ئەژنەوم› ٢. ☜ **مشمشە** ≡ ١. نفس ٢. ☜ **مشمشه**

**مشە**²: ئاوەڵناو. ١. زۆر؛ زەحف؛ بۆش ‹جێژنان پلاو و خۆرشت مشەیە› ٢. مفت؛ خۆڕایی ‹... هەر لەم دیوەی بستووی ژیان چووی بەو دیوا، ڕووباری هەنگوین و شیرە و باخ هەنار و هەنجیرە و حۆری زۆرە و کەیف و ڕابواردن مشەیە! ... «هەژار، *چوار ناميلكه*»› ≡ ١. بسیار ٢. مُفت

**مشە**³: دەنگەناو. دەنگی هەناسەی لە کەپۆوە ‹ئای ئەو ماڵە چەن ئاوایە/ کە دایک و باو لای بێشکەدا/ گوێیان لە مشەی ساوایە «گۆران»› ≡ صدای نفس از بینی

**مشەخت** / m(i)şext/: ئاوەڵناو. ئاوارە؛ دەربەدەر ≡ آواره

**مشەخۆر** / m(i)şexor/: ئاوەڵناو. *[پلار]* چەورە؛ زگ‌لەوەڕێن؛ سەرباری خەڵک ≡ طفیلی

**مشەڕەت** / m(i)şeřet/: ئاوەڵناو. *[پلار]* موشەڕەت؛ ناردراو بۆ جەهەندەم ≡ فرستاده شده به دَرَک

**مشەفل** / m(i)şefil/: ناو. زنار؛ هەڵەمووت؛ هەزار بە هەزار ≡ پرتگاه

**مشەقەت** / m(i)şeqqet/: ناو. مشەقەت؛ ئەرکی گران؛ زەحمەتی زۆر ≡ مشقّت

**مشەقە** / m(i)şeqe/: ناو. پینەچی؛ پینەدۆزی

کەوشان 🇮🇷 پینەدوز

**مشەقەت** / m(i)şeqet/: ☜ **مشەققەت**

**مشەکەر** / m(i)şeker/: ناو. ١. زیندەوەر؛ گیاندار ٢. *[کینایە]* کەس ‹مشەکەر نییە لە مالا› 🇮🇷 ١. جاندار ٢. جُنبنده

**مشەگرە** / m(i)şeg(i)re/: ناو. ترۆمتە؛ تورومتە؛ تۆرمتە 🇮🇷 تُرمتای

**مشەما** / m(i)şema/: ☜ **مشەمما**

**مشەمر** / m(i)şemir/: ئاوەڵناو. ١. فرێدراوی بێخاوەن ٢. بەش‌نەکراو لە ناو هاوبەشاندا 🇮🇷 ١. بی‌صاحب ٢. مُشاع

**مشەمش** / m(i)semiş/: دەنگەناو. مخەمخ؛ دەنگی هەناسەی زۆر 🇮🇷 صدای هِن‌وهِن بسیار

**مشەمما**[1] / m(i)şemma/: ناو. مشەما؛ پۆشەنێکی پلاستیکی بۆ منال پێچانەوە 🇮🇷 مُشمع

**مشەمما**[2]: ئاوەڵناو. مشەما؛ مشە؛ مشەمەر؛ شەم پێدا ساویاو 🇮🇷 مومینه

**مشەممەر** / m(i)şemmer/: ئاوەڵناو. مشە؛ زۆر؛ فرە 🇮🇷 فراوان

**مشەمەر** / m(i)şemer/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **مشەممەر** ٢. ☜ **مشەمما**[2]

**مشەورە** / m(i)şew(i)re/: ناو. ڕاوێژ؛ تەگبیر؛ شیرەت 🇮🇷 مشورت

**مشەوش** / m(i)şewiş/: ناو. نیسکی لە دەستار کراوی بێ‌تێکوڵ 🇮🇷 عدس پوست‌کنده

**مشەوشی** / m(i)şew(i)şî/: ناو. چێشت لە نیسکی دەستارکراو 🇮🇷 آش عدس پوست کنده

**مشەوەش** / m(i)şeweş/: ئاوەڵناو. شێویا؛ ئاڵۆز 🇮🇷 آشفته؛ مشوّش

**مشەهت** / m(i)şeht/: ئاوەڵناو. ١. بێکەس و بێ‌ئاریکار ٢. ناهمێ لە ژیان 🇮🇷 ١. بی یار و مددکار ٢. نومید

**معین** / mi'în/: ☜ **مایین**

**مغار** / m(i)ğar/: ناو. ١. ☜ **مەغارە** ٢. موغار؛ مکارە؛ تیختێکی دارکۆڵینی نەجارانە 🇮🇷 ١. ☜ مەغارە ٢. مُغار

**مغارە** / m(i)ğare/: ☜ **مەغارە**

**مغاری** / m(i)ğarî/: ناو. بخێری؛ سۆبە؛ سۆمپا؛ کوورە 🇮🇷 بخاری

**مغازە** / m(i)ğaze/: ☜ **مەغازە**

**مف** / mif/: دەنگەناو. فن؛ دەنگی لووت لە چڵم سڕیندا 🇮🇷 فین

**مفا** / m(i)fa/: ناو. موفا؛ شفا؛ حاڵەتی چا بوون لە نەخۆشی ‹ئێمە وێڕای ئەم قورعانە، شتی واو بۆ بەڕێ دەکەین کە مفا و بەزەی تێدایە بۆ خاوەن باوەڕەکان و ... «هەژار، *قورئان*»› 🇮🇷 شفا

**مفاجات** / m(i)facat/: ناو. موفاجات؛ قۆتک؛ وەستان؛ جەڵتە؛ سەکتە؛ دۆخ یان چۆنیەتی وەستانی لەنکاوی دڵ یان مێشک 🇮🇷 سکته

**مفاڵ** / m(i)fał/: ئاوەڵناو. سەرلێ‌شێواو؛ چەواشە 🇮🇷 سردرگُم

**مفت**[1] / mift/: ☜ **مفتی**[2]

**مفت**[2]: ئاوەڵکار. مفتە: ١. بەلاش ٢. هەرزان ‹کەوشەکانت مفت کڕیوە!› 🇮🇷 ١. مُفت ٢. ارزان

**مفتا** / mifta/: ناو. کلیل؛ کلێل؛ ئاچەر 🇮🇷 کلید

**مفتخۆر** / miftxor/: ناو. مفتەخۆر؛ موفتخۆر؛ کەسێ کە بێ ماندوو بوون و بێ نرخ دان دەیەوێ بژی 🇮🇷 مُفتخور

**مفتە**[1] / mifte/: ناو. مفتا؛ کلیل؛ هاچەر 🇮🇷 کلید

**مفتە**[2]: ☜ **مفتی**[3]

**مفتەخۆر** / miftexor/: ☜ **مفتخۆر**

**مفتەکی** / miftekî/: ☜ **مفتی**[2]

**مفتەگی** / miftegî/: ☜ **مفتی**[2]

**مفتی**[1] / miftî/: ناو. موفتی؛ فتوادەر؛ ئەو کەسەی هێزای فتوا دانە 🇮🇷 مُفتی

**مفتی**[2]: ئاوەڵناو. مفت؛ مفتە؛ مفتەکی؛ مفتەگی؛ مفتێ؛ موفت؛ خۆڕایی؛ بەلاش 🇮🇷 رایگان

**مفتی**[٢]: ئاوەڵکار. مفت؛ مفتـە؛ مفتـەکی؛ مفتـەگی؛ مفتێ؛ موفت؛ بەلاش ‹مفتی دەستت کەوتووە!› 🇮🇷 رایگان

**مفتێ / miftê/**: ☜ **مفتی**[٢]

**مفردی / mifirdî/**: ناو. گەنجی چەکدار 🇮🇷 جوان سلحشور

**مفرز / mifriz/**: ناو. ژنێ کە دەلالی بۆ پیاوان دەکا 🇮🇷 مِترس؛ زن دیوث

**مفسک / mifsik/**: ناو. کەوگیر؛ کەفگیر 🇮🇷 کفگیر

**مفو / m(i)fû/**: ئاوەڵناو. چڵمن؛ بلقن 🇮🇷 خلمو

**مفەتیش / m(i)fetîş/**: ناو. ماڵپشکن؛ پشکن 🇮🇷 مُفتش

**مفەتین / m(i)fetîn/**: ئاوەڵناو. ئاژاوەچی 🇮🇷 فتنەانگیز

**مفەیتەن / m(i)feyten/**: ناو. گسک؛ گزک 🇮🇷 جارو

**مڤرۆ / mivro/**: ئاوەڵناو. سەقەت؛ نوقسان 🇮🇷 معلول

**مڤرەزە / mivreze/**: ناو. دەستەیەک لە چەکدار کە بۆ کارێ تایبەتی دەچن 🇮🇷 گروه مسلح

**مق**[١] **/ miq/**: ناو. پۆق؛ ناوچاوتاڵی و ڕووگرژی 🇮🇷 اخم

⊡ **مق کردن**: پۆق کردن؛ ڕوو گرژ کردن و هیچ نەگوتن 🇮🇷 اخم کردن همراه با سکوت

**مق**[٢]: ئاوەڵناو. گیف؛ ئامادەی کار 🇮🇷 آمادەی کار

⊡ **مق کردن**: خۆ گیف کردن لە کار یان شەڕ 🇮🇷 خود را آماده کردن

**مق**[٣]: دەنگەناو. مخ؛ دەنگی هەناسە دەردان لە لووتەوە 🇮🇷 صدای تنفس از بینی

**مقات / m(i)qat/**: ☜ **مقاتە**

**مقاتە / m(i)qat/**: ئاوەڵناو. مقات؛ لە خۆ ئاگادار 🇮🇷 مواظب

**مقار / m(i)qar/**: ناو. مقۆڕ؛ ئامرازێکی دار کۆڵین 🇮🇷 مُغار

**مقاش / m(i)qaş/**: ☜ **مەقاش**

**مقام / m(i)qam/**: ناو. مەقام: ١. قام؛ جۆرێ گۆرانی ٢. گۆرانی 🇮🇷 ١. آهنگ ٢. ترانه

**مقامبێژ / m(i)qambêj/**: ناو. گۆرانیبێژ؛ قامبێژ؛ دەنگبێژ 🇮🇷 خواننده

**مقاندن / m(i)qandin/**: چاوگ. مقانن؛ مرقاندن 🇮🇷 با دهان بسته صدا از گلو درآوردن

**مقانن / m(i)qanin/**: ☜ **مقاندن**

**مقاو / m(i)qaw/**: ☜ **مەقاو**

**مقاوەلە / m(i)qawele/**: ناو. کاری بە قەبەڵ 🇮🇷 کُنترات

**مقایی / m(i)qayî/**: ☜ **مەقاو**

**مقڕ / miqiř/**: ئاوەڵناو. سەرسەخت و گیڕ 🇮🇷 لجباز

**مقل / miqil/**: ☜ **مقلێ**

**مقلەک / miqlek/**: ☜ **مقلێ**

**مقلێ / miqlê/**: ناو. مقل؛ مقلەک؛ تاوە؛ دەفری پەلی شت تێدا سوور کردنەوە 🇮🇷 تابه

**مقۆڕ / m(i)qoř/**: ☜ **مقار**

**مقۆمقۆ / m(i)qom(i)qo/**: ناو. کاری دمڵەدم نان و چەقە و گوڕە ‹گوێم لە مقۆمقۆی دو کرێکار بوو› 🇮🇷 اشتلم؛ داد و قال

**مقە / m(i)qe/**: ☜ **مرقە**

**مقەبا / m(i)qeba/**: ☜ **مقەوا**

**مقەببا / m(i)qebba/**: ☜ **مقەوا**

**مقەپەت / m(i)qepet/**: ئاوەڵناو. کپ؛ داخراو بەبێ بابوێر ‹دەرگاکە مقەپەت کە!؛ ئەم قوتووە سەری مقەپەتە› 🇮🇷 کیپ؛ آکبند

**مقەدەر / m(i)qeder/**: ناو. ڕووداوی نەخوازراو ‹مقەدەرێکیان بۆ هاتووە› 🇮🇷 رویداد ناگوار

**مقەرس / m(i)qeris/**: ئاوەڵناو. دژایەتیکەر؛ بە کێشە و نەسازاو 🇮🇷 ستیزەجو

**مقەس / m(i)qes/**: ☜ **مقەست**

**مقەست / m(i)qest/**: ناو. مقەس؛ مەقەس؛ مەقەست؛ قەیچی؛ تۆرتۆ 🇮🇷 قیچی

**مقەستە / m(i)qeste/**: ناو. مەقەستە؛ کاری

لنگدانی ئەسپ بە تەرزی قیلەوقاچ ☰ عمل مارپیچ راندن اسب

◘ **مقەستە کردن:** قاپاوێژ کردن؛ قاچ وێک کەوتن لە کاتی ڕۆشتندا، زۆرتر بە هۆی برسییەتی یان ماندوو بوون ‹هاتمەوە، لاقم مقەستەی دەکرد «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ به هم خوردن پاها هنگام راه رفتن از گرسنگی یا خستگی

**مقەسوک** / m(i)qesuk/: ☞ **مقەسۆك**

**مقەسۆك** / m(i)qesok/: ناو. مقەسوک؛ میقەسووک؛ پەڕەسێلکە؛ پلیزرگ ☰ پرستو

**مقەشەر** / m(i)qeşer/: ناو. نوخۆشەر؛ نخۆشەر؛ نوخوەشەر؛ لەپە ☰ لپه

**مقەلک** / m(i)qelik/: ☞ **مقلێ**

**مقەلی** / m(i)qelî/: ☞ **مەنقەڵ**

**مقەنەزمە** / m(i)qenezme/: ناو. چەخماخی تفەنگ ☰ گلنگدن تفنگ

**مقەوا** / m(i)qewa/: ناو. مقەبا؛ مقەبا؛ مقەووا؛ قاقەزی زۆر ئەستوور ☰ مقوا

**مقەور** / m(i)qewir/: ناو. کدووبارزانی؛ شاقەباغی ☰ کدوحلوایی

**مقەووا** / m(i)qewwa/: ☞ **مقەوا**

**مقیر** / m(i)qîr/: ☞ **مکوڕ-۱**

**مقێر** / m(i)qêr/: ئاوەڵناو. ۱. مکوڕ؛ پێ لە گوناحی خۆ هێن ۲. پێداگر ☰ ۱. مُعترف ۲. مُصر

**مکارە** / m(i)kare/: ناو. موغار؛ مغار؛ ئامرازی دار کۆڵین ☰ مُغار

**مکوڕ** / m(i)kuř/: ئاوەڵناو. موکوڕ: ۱. مقیر؛ دان بە تاوانی خۆدا ناو ۲. یاغی؛ سەرسەخت ‹هەیبێ هێز و گورد و تین و تاو و گوڕ/ ڕۆژگاری ڕەش نەبێ بەختی مکوڕ «هێمن»› ☰ ۱. مُعترف ۲. یاغی

**مکوڕی** / m(i)kuřî/: ناو. سەرکەشی؛ سەربزێوی؛ سەربزۆکی ☰ تمرُد

**مکوڵ** / m(i)kuł/: ناو. بۆسە؛ کەمین ☰ کمین

◘ **مکوڵ گرتن:** بۆسە گرتن/ خواردن؛ لە بەرگەوە دانیشتن ☰ کمین کردن

**مکوس** / m(i)kûs/: ناو. ئاوات؛ ئارەزوو؛ واز ‹ئەم سەد هەزار بێ مکووس/ ل جزیرێ بێ نفووس «جگەرخوێن»› ☰ آرزو

**مکوم** / m(i)kûm/: ئاوەڵناو. قایم؛ پتەو ☰ مُقاوم

**مکێنە** / m(i)kêne/: ناو. نکێنە؛ باڵدارێکە ☰ آوست

**مگۆرت** / m(i)gort/: ئاوەڵناو. یاخی؛ سەرەڕۆ ☰ یاغی

**مگێز** / m(i)gêz/: ناو. واز؛ ئارەزوو ☰ آرزو

**مل**[1] / mil/: ناو. ۱. ئەستۆ؛ گەردن ۲. *[مەجازی]* شان؛ شەپیلک ۳. باڵ؛ قۆڵ ☰ ۱. گردن ۲. کتف ۳. بازو

◙ **مل لە مو باریکتر:** *[مەجازی]* ئامادە بۆ گشت جۆرە فەرمانێ ☰ آماده برای فرمانبرداری

◘ **مل با دان:** ۱. بە زۆر ناچار کردن ‹ملی بادا لێی ساند› ۲. سەر بادان؛ سەرپێچی کردن ‹مل با مەدە قەت لە ئەمری یەزدان› ☰ ۱. مجبور کردن ۲. سرپیچی کردن

**مل پیاییش** ۱. سووچ و تاوان خستنە سەر کەسی تر ۲. سەر نانە سەر بۆ گاڵتە پێ کردن ☰ ۱. تاوان را به گردن دیگری انداختن ۲. سر به سر گذاشتن

**مل پیا/ پێداکردن:** لە ئەستۆ گرتن ‹ملی پیا کرد و گشت پوولەکەی دا› ☰ بر گردن گرفتن

**مل پێوە نان** مل لێ نان: ۱. *[پەلار]* کردنی کارێک و گوێ بە ئاکامی نەدان ۲. دەس بە کار بوون ☰ ۱. بی‌گُدار به آب زدن ۲. دست به کار شدن

**مل حیز کردن:** خۆ کز و بەستەزمان نواندن و لە ڕاستیدا پێچەوانەی بوون ‹سەری خۆمان داخست و ملمان حیز کرد متەقمان لە بەر نەهاتە دەر «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ حالت مظلوم به

خود گرفتن و عکس آن بودن

**مل خووس کردن:** مل دانەواندنی بەراز بۆ شەڕ ≡ گردن انداختن گراز برای حمله

**مل دان:** ۱. ڕەزا دان؛ سەر دانەواندن ۲. بە قسە کردن؛ گوێ شل کردن ≡ ۱. گردن نهادن ۲. گوش کردن

**مل دە/ لە بەر مل نان:** ۱. تێکەوە گلان ۲. بە پێداگرییەوە خەریکی کارێک بوون ≡ ۱. گلاویز شدن ۲. با جدیت مشغول به کاری شدن

**مل دەبەر نان:** بە پێداگرییەوە خەریک بوون ≡ با جدیت مشغول شدن

**مل ڕاکێشان:** ۱. مل دان ۲. دڵنیا بوون ≡ ۱. اطاعت کردن ۲. راضی شدن

**مل شکاندن:** /کنایە/ ۱. زۆر زیان پێ‌گەیاندن ۲. ڕۆیشتنی خوێنتاڵ ≡ ۱. آسیب رساندن ۲. رفتن مُزاحم

**مل کرن:** لە سەر قەڵاندۆش دانان ≡ کول گرفتن

**مل کز کردن:** لارەمل وەستان؛ دەربڕینی بێ‌دەسەڵاتی و ئاتاجی خۆ ‹هەڵسە بەسە پێش خواردن و مل کز کردن/ مەی تێکە بخۆین لە باتی خەم بۆ مردن «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ≡ گردن کج کردن

**مل کێشان:** سەر کێشان؛ ڕوانین ‹ملم کێشا بزانم چ باسە› ≡ سرک کشیدن

**مل لە چەقۆ خستن:** ☜ **مل لە چەقۆ هەڵسوون**

**مل لە چەقۆ ساوین:** ☜ **مل لە چەقۆ هەڵسوون**

**مل لە چەقۆ هەڵسوون:** /کنایە/ مل ڕە چەقۆ خستن؛ مل لە چەقۆ ساوین/ خستن؛ کاری خەتەر کردن ≡ خطر کردن

**مل لێنان:** ☜ **مل پێوەنان**

**مل نان/ نیان:** ۱. دەس بە کار بوون؛ مل پێوە نان ‹ماڵ ئاگری گرت لە سەر هەتا خوار/ تاژدین ملی نا لە داد و هاوار «هەژار، *مەم و زین*»› ۲. بێ سەرکردنەوە چوون ‹پێشمەرگە ملی ناوە بە چیاوە› ≡ ۱. دست به کار شدن ۲. بی‌پروا رفتن

**مل نەدان:** ڕازی نەبوون؛ قەبووڵ نەکردن ≡ گردن ننهادن

**ملی ڕێ/ ڕێگە گرتن:** سەری خۆ داخستن و چوون؛ بێ ئاوڕدانەوە ڕێگایەک گرتنە بەر ‹لەگەڵ خۆرا بەیانیان هەڵئەهاتین/ ملی ڕێگەی هەورازی ژینمان ئەگرت «شێرکۆ»› ≡ پا در راه گذاشتن

**بوونە مل کەسێکەوە:** ئەرکێک کەوتنە مل کەسێ؛ زەحمەت و کارێک کەوتنە ئەستۆی کەسێ ‹ئەم باریشە لەم ئاخرەوە بووە ملمان›. هەروەها: **خرانە مل کەسێکەوە؛ خستنە مل کەسێکەوە** ≡ سربار کسی شدن

**دانە مل کەسێکا:** بە زۆری (شتێ) بە کەسێک دان ‹گەرەکی نەو، دامە ملیا› ≡ با اصرار و فشار (چیزی را) به کسی دادن

**کردنە مل کەسێکد:** بە زۆر پێ کردن ‹گشت کارەکانتان کردۆتە مل ئەو داماوە›. هەروەها: **کرانە مل کەسێک** ≡ به گردن کسی گذاشتن

**لە مل خۆ کردنەوە:** لە کۆڵ خۆ کردنەوە؛ بەرپرسایەتی کارێک دانە دواوە ≡ از گردن خود باز کردن

**نانە مل کەسێکد:** کەسێک پێوە کردن ‹دزییەکەتان نایە مل من› ≡ به گردن کسی انداختن

**هاتنە مل کەسێکدا:** ۱. کەوتنە مل کەسێکدا ۲. نیشتنە پای کەسێ ‹ئەم کارەش هاتە مل ئەو› ۳. بە سەر کەسێکدا هاتن ‹بەلایێ خراو هاتە ملیا› ≡ ۱. روی دوش کسی افتادن ۲. به گردن کسی افتادن ۳. بر سر کسی آمدن

**مل**[۲]: ئاوەڵکار. سەر؛ بان ‹مەیکە مل یەکا› ≡ رو

**مل‌ئەستوور** / mil'estûr/: ئاوەڵناو. مل‌ستوور؛

خپشەملە؛ مل‌قەوی ▣ گردن‌کُلُفت

**ملا** / m(i)la/: ☜ **ملان**

**ملاحەزە** / m(i)laĥeze/: ناو. ١. کار و ڕەوتی دیتن؛ بەردان؛ چاو لێ‌کردن ٢. نیشانک؛ بابەتێ کە لە بڕیار یا داوەریەکدا گرینگە ٣. پەروا؛ پارێز ▣ ١تا٣. مُلاحظه

**ملازگ** / m(i)lazig/: ☜ **مەلاشو**

**ملاقات** / m(i)laqat/: ناو. مولاقات؛ دیدار؛ دیمانە؛ دیەنی؛ دیدەنی؛ پێرگین؛ پەرگین؛ کار و ڕەوتی دیتن ▣ مُلاقات

**ملاک** / m(i)lak/: ناو. جەرگ؛ جگەر ▣ جگر

**ملاکەت** / m(i)laket/: ☜ **مەلایکە**

**ملان** / m(i)lan/: ناو. مەلا؛ جۆرێ هەڵپەڕکێ ▣ نوعی رقص گروهی

**ملانە** / m(i)lane/: ☜ **ملانێ**

**ملانێ** / m(i)lanê/: ناو. ملانە؛ ململانە؛ ململانێ؛ ملەملە؛ ملێ‌ملێ: ١. زۆرەوانی ٢. بەربەرەکانێ ٣. ڕکەبەری؛ ڕکەبەرکێ ▣ ١. کُشتی ٢. مُقابلە ٣. رقابت

**ملانێکەر** / m(i)lanêker/: ناو. کۆچەگر؛ زۆران‌باز؛ زۆرەبان‌باز ▣ کُشتی‌گیر

**ملایم** / m(i)layim/: ناوەڵناو. نەرم؛ هێواش؛ بێ‌توندی، سەختی یان تەوژم ▣ مُلایم

**ملباریک** / milbarîk/: ناوەڵناو. */پلار/* قیق ▣ گردن‌باریک

**ملبەملە** / milbem(i)le/: ☜ **ملبەملێ**

**ملبەملێ** / milbem(i)lê/: ناو. ملبەملە: ١. کاری دە گژ یەک ڕاچوون ٢. ڕکەبەری ٣. کێبەرکێ ▣ ١. عمل گلاویز شدن ٢. رقابت ٣. مُسابقه

**ملبەند** / milbend/: ☜ **ملوانکە**

**ملپان** / milpan/: ناوەڵناو. */پلار/* ١. تەمەڵی قەڵەو ٢. گەواد ▣ ١. چاق تنبل ٢. گَواد

**ملپوت** / milpût/: ناوەڵناو. مل‌قەوی؛ مل‌ئەستوور ▣ گردن‌کلفت

**ملپێچ** / milpêç/: ناو. چنراوێکی درێژ و باریک، ساکار یان گوڵدار بۆ داپۆشانی سەر و مل لە سەرمادا ▣ شال‌گردن

**ملتاف** / miltaf/: ناو. دەردی گران ▣ بیماری صعب‌ُالعلاج

**ملتیان** / milt(i)yan/: ناو. جاش‌باڵتە؛ پاڵتۆی کورتی تا سەر ئەژنۆ ▣ پالتوی کوتاه

**ملچانن** / milçanin/: ☜ **مڵچاندن**

**ملچۆک** / milçok/: ناو. کلچۆک؛ میلی کلدان ▣ میل سُرمەدان

**ملچەوت** / milçewt/: ناوەڵناو. مل‌خوار ▣ گردن‌کج

**ملخوار** / milx(i)war/: ناوەڵناو. مل‌چەوت ▣ گردن‌کج

**ملخەت** / milxet/: ناو. کەنارەی هێلی جووت کە بە گاسن بەرزەوە بووە ▣ کنارەی بلندتر شیار شخم

**ملخێش ـ ملخێش** / milxêş milxêş/: ناوەڵکار. مرخێش ـ مرخێش؛ دۆخی ماندوویی و هەناسەسواری بە هۆی ڕاکێشانی شتی قورسەوە ▣ کشان ـ کشان

**ملدرێژ** / mild(i)rêj/: ناوەڵناو. */پلار/* وشترمل ▣ گردن‌دراز

**ملدەر** / milder/: ناوەڵناو. */کینایە/* بەیدەست؛ تەسلیم ▣ تسلیم و سپر انداخته

**ملدەس** / mildes/: ناو. بازنە؛ خرخاڵ ▣ النگو

**ملدەسی** / mildesî/: ناو. ١. کەلەبچە ٢. بازنە ▣ ١. دستبند ٢. النگو

**ملستور** / mils(i)tûr/: ☜ **مل‌ئەستور**

**ملشۆ** / milşo/: ☜ **ملیوان**

**ملشۆڕ** / milşoř/: ناوەڵناو. */کینایە/* ١. شەرمەزار ‹با ملشۆڕی لای ئەم و ئەو نەبین› ٢. تەسلیم؛ بەیدەست ▣ ١. شرمنده ٢. تسلیم

**ملشۆڕی** / milşořî/: ناو. شەرمەزاری؛

خەجاڵەتباری ▤ شرمندگی

**ملڤان** / /milvan/: ☜ **ملڤانك**

**ملڤانک** / /milvanik/: ناو. ملڤان: ١. گەردەنبەند ٢. کالان؛ دۆدک؛ تۆق ▤ ١. گردنبند ٢. قلاده

**ملق** / /milq/: ناو. ١. بلقی کوڵینی ئاو ٢. جوێن؛ دژمان ٣. گورم؛ ڕەوتی سەر بزواندنی بەرخ کاتێک دایکی دەمژێ ▤ ١. حباب آبِ جوشان ٢. دُشنام ٣. عمل سر زدن برّه هنگام مکیدن پستان گوسفند

**ملقەوی** / /milqewî/: ئاوەڵناو. ١. ملپووت؛ ملئەستوور ٢. ☜ **ملهوڕ**[٢] ▤ ١. گردن‌کلفت ٢. ☜ **ملهوڕ**[٢]

**ملک** / /milk/: ناو. ١. کۆپار؛ کۆپانە؛ دووگ؛ زۆپی سەر پشتی تاقمێ گوهاندار (وەک: وشتر، گا، وال) ٢. خوری نەقرتاو بە ملی پەزەوە ٣. لێواری کێشسانی وەک هی دەسکێش ▤ ١. کوهان ٢. پشم مانده بر گردن گوسفند ٣. کشباف

**ملکڕ** / /milkiř/: ئاوەڵناو. ملکورت ▤ گردن‌کوتاه

**ملکز** / /milkiz/: ئاوەڵناو. کز و خەمبار ‹شانکز و ملکز پای دیواران خوەم/ غەریب و بێکەس لە نێو شاران خوەم «فولکلۆر»› ▤ افسُرده

**ملکزی** / /milk(i)zî/: ناو. *[کینایە]* کزی؛ خەمباری ‹تا کەی لە باغی خەڵکی بە زیزی و بە ملکزی؟/ خۆشە لە باغی عێلی چنینی هەنار و سێو «سەیفولقوزات»› ▤ گردن‌کجی

**ملکورت** / /milkurt/: ئاوەڵناو. ملکوڵ؛ ملکڕ ▤ گردن‌کوتاه

**ملکە** / /milke/: ناو. گەردەن؛ مل ▤ گردن

**ملکەج** / /milkec/: ☜ **ملکەچ**

**ملکەچ** / /milkeç/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* ملکەج؛ گەردنکەچ؛ ژێرفەرمان ‹ساقیا! بۆ کوێ دەچی؟ بۆ کوێ دەچی؟/ تۆش لە بەر ئەو ملهوڕانە ملکەچی؟ «هێمن»› ▤ فرمانبردار

**ملکەچی** / /milkeçî/: ناو. *[کینایە]* لارەملی؛ کەنفتی ‹بە ملکەچییەوە دەمپرسی: شوغل ما کو؟ «هەژار، چێشتی مجێور»› ▤ گردن‌کجی

**ملکەو** / /milkew/: ئاوەڵناو. *[مەجازی]* جوان و خوشیک ▤ دلبر زیبا

**ملکیڕ** / /milkîř/: ئاوەڵناو. لاسار؛ گوێنەبیس هەروەها: **ملکیڕی** ▤ لجوج

**ملگێر** / /milgêr/: ئاوەڵناو. ئەستۆخواروخێچ ▤ گردن‌کج

**ملگێرە** / /milgêře/: ناو. دارەسمە؛ دارتەقێنە ▤ دارکوب

**ملا** / /milla/: ☜ **مەلا**

**ملە** / /mille/: ☜ **مەلا**

**مملانە** / /milm(i)lane/: ☜ **ملانێ**

**مملانێ** / /milm(i)lanê/: ☜ **ملانێ**

**مملین** / /milm(i)lîn/: چاوگ. بە خشکەوە بزووتن؛ جینگڵدان ▤ خزیدن

**ملنایەنە** / /milnayene/: چاوگ. بۆڵەبۆڵ کردن ▤ غرولند کردن

**ملوان** / /milwan/: ☜ **ملیوان**

**ملوانک** / /milwanik/: ☜ **ملوانکە**

**ملوانکە** / /milwanke/: ناو. ملبەند؛ ملوانە؛ ملوانک؛ ملوەن؛ ملوێنک؛ ملوێنکە؛ ملوێنە؛ ملوێن؛ ملەوانە؛ ملیوانە؛ گەردەنبەند؛ گەردانە ▤ گردنبند

**ملوانە** / /milwane/: ☜ **ملوانکە**

**ملوڕ** / /milwiř/: ☜ **ملهوڕ**[٢]

**ملول** / /m(i)lul/: ئاوەڵناو. ١. دڵتەنگ؛ دڵگیر؛ دڵمەند ٢. خەمبار؛ خەمین ▤ ١. دلتنگ ٢. غمگین

**ملولەی** / /m(i)luley/: ناو. ١. دڵتەنگی؛ دڵمەندی ٢. خەمباری؛ خەفەتباری ▤ ١. دلتنگی ٢. غمگینی

**ملوەن** / /milwen/: ☜ **ملوانکە**

**ملـوێن / milwên**/: نـاو. ١. ☜ **ملیـــۆن** ٢. ☜ **ملوانکه**

**ملوێنک / milwênik**/: ☜ **ملوانکه**

**ملوێنکه / milwênke**/: ☜ **ملوانکه**

**ملوێنه / milwêne**/: ☜ **ملوانکه**

**ملوێنەر / milwêner**/: ☜ **ملیۆنر**

**ملوێنێڕ / milwêněr**/: ☜ **ملیۆنر**

**ملۆ / m(i)lo**/: ☜ **کوله ـ١**

**ملۆچکه / m(i)loçke**/: ☜ **مێرووله**

**ملۆره / m(i)lore**/: ☜ **مێرووله**

**ملوم / m(i)lûm**/: ئاوەڵناو. شلەتین؛ شیرەگەرم؛ نه گەرم و نه سارد ☰ ولرم

**مله / m(i)le**/: ناو. ١. ڕکه؛ کێبەرکێ ‹ڕێگه دەبـڕم کوانێ هەنگاوم شله/ ڕاسته بێهێزم، دەکەم ئەمما مله «هـێمن»› ٢. بســتوو؛ زینــوو ☰ ١. مُســابقه ٢. گردنەی کوه

**مله پێچی / m(i)lepêçî**/: ناو. سەربزێوی ☰ سرکشی

**ملەت / m(i)let**/: ناو. ١. شـوێنکەوتوو؛ پەیـڕەو ٢. کۆمەڵی له ڕەگەزێک ☰ ١. پیرو ٢. ملّت

**ملەتاتکێ / m(i)letatkê**/: ناو. ملەقوته؛ کاری سەر کێشان و نزم بوونەوە بـۆ دیـتنی شـتێ ‹لـه بـەر ملەتاتکێی بەر کامێرا زللەیەکی چـەوری خـوارد› ☰ عمل سَرَک کشیدن

**ملەچۆچه / m(i)leçoçe**/: ☜ **ملەقۆچه**

**ملەخڕه / m(i)lex(i)ře**/: ☜ **ملەخڕێ**

**ملەخڕێ / m(i)lex(i)řê**/: نـاو. ملەخڕه؛ ملەماسـێ؛ سەرپەنام؛ سەرپەنم؛ سەرپنۆم؛ گوێڕەپە؛ ئۆریۆن؛ گووشـەک؛ نەخۆشــی پەنـەمانی تونـدی لـووی بن‌گوێ ☰ اُریون

**ملەزەن / m(i)lezen**/: ناو. ڕێگر؛ گـۆران؛ چەتـه ☰ راهزن

**ملەقوته / m(i)lequte**/: ☜ **ملەتاتکێ**

**ملەقۆته / m(i)leqote**/: ☜ **ملەقۆچه**

**ملەقۆجه / m(i)leqoce**/: ☜ **ملەقۆچه**

**ملەقۆچه / m(i)leqoçe**/: نـاو. قۆچەمل؛ قۆچەملـه؛ ملەچۆچه؛ ملەقۆجـه؛ ملەقۆرتـه؛ ملەقۆتـه؛ ملـی بڕدراوی مریشک ☰ گردن بریُده‌ی مُرغ

**ملەقۆرته / m(i)leqorte**/: ☜ **ملەقۆچه**

**ملەک / m(i)lek**/: ناو. بارێ که دەخرێته سەر شان ☰ باری که بر دوش گذارند

**ملەکەر / m(i)leker**/: ئاوەڵناو. هاڤـڕک؛ هەڤـڕک؛ ڕکابەر؛ بەربەرەکانێ‌کەر ☰ رقیب

**ملەگا / m(i)lega**/: نـاو. ١. ڕێژاو؛ ئاوڕێژگه؛ شوێنی تێکەڵ بوونی دوو چۆم ٢. بستوو؛ زینـوو؛ ملـەی کێو ☰ ١. مصب ٢. گردنەی کوه

**ملەگۆ / m(i)lego**/: ناو. بەرموور لـه گـوێ زێـڕ ☰ گردنبند از گویچه‌های طلا

**ملەگەوی / m(i)legewî**/: ☜ **ملەگەوێ**

**ملەگـەوێ / m(i)legewê**/: نـاو. مالوێنچـه؛ مـالۆچ؛ مالۆچـــه؛ مالەوێچـــه؛ مالەوێنچـــه؛ ملەوێچـــه؛ ملەگەوی؛ مەلەگەوێ؛ گیایەکه له ڕوەکی نزیـک خـۆی پـێچ دەخـوا، لـەوەڕێکی خۆشـه و بـه چێشتیش لێ دەنرێ ☰ گیاه ملوکیه

**ملەما / m(i)lema**/: نـاو. دەست‌لەملان ☰ دست در گردن

**ملەماسێ / m(i)lemasê**/: ☜ **ملەخڕێ**

**ملەمله / m(i)lem(i)le**/: ☜ **ملاتێ**

**ملەنیر / m(i)lenîr**/: ناو. لبادێ که له بـن نـیرەوە دەچێته سەر ملی گا ☰ نمد زیر یوغ بر گردن گاو

**ملەوانـه / m(i)lewane**/: نـاو. ١. ☜ **ملوانکـه** ٢. ☜ **ملیوان**

**ملەوێچه / m(i)lewêçe**/: ☜ **ملەگەوێ**

**ملهـوڕ[١] / milhuř**/: نـاو. باڵـندەیەکه لــه تــیرەی مراوییـــەکان و تۆرەمـــەی وەردەک، نزیـــک ٥٥ سانتیمیتره، له دەستەی بچووک و هەروەها تـاق ـتاق له سەر ئاوی پڕ شەپۆلدا هات‌وچۆ دەکـا ☰

اسکوتر بال سفید

**ملهور**[۲]: ئاوەڵناو. مل‌ورِ؛ مل‌قەوی؛ شەلاتی؛ زۆرداری زۆربێژ ‹بۆ کەسێکە مەی چزیلکی پێوە نیێ/ بۆچی ملهورِ لێرە بینی پێوە نیێ؟ «هێمن»› ☰ گردن‌کُلُفت

**ملهوری** / milhuřî/: ناو. ئالی؛ لاساری؛ کەڵەگایی ☰ گردن‌کلفتی

**ملهێب** / milhêb/: ناو. مالێب؛ مالێڤ؛ ملێب؛ مەلهەب؛ مەلێڤ؛ کاریچ؛ تەبوور؛ شەنەی خەرمان بادان ☰ افشون

**ملیارد**[۱] / milyard/: ناو. میلیارد؛ ژمارەی سەرەکی بەرانبەر بە هەزارملیۆن ☰ ملیارد

**ملیارد**[۲]: ئاوەڵناو. میلیارد: ۱. بە ئەندازە و چەنیەتی ملیاردەوە ۲. لە جێگە و پلەی ملیارددا ☰ ۱و۲. ملیارد

**ملیاردر** / milyardir/: ئاوەڵناو. یەکجار دەوڵەمەند؛ دەوڵەمەندی خاوەن یەک یان چەند ملیارد ☰ ملیاردر

**ملیاکەت** / milyaket/: ☜ مەلایکە

**ملیان** / milyan/: چاوگ. ۱. بزووتن ۲. چەکەرە دان ☰ ۱. رفتن ۲. جوانه زدن

**ملیای** / milyay/: چاوگ. ڕۆیشتن؛ چوون ☰ رفتن

**ملیچک** / m(i)lîcik/: ☜ چۆلەکە

**ملیس** / m(i)lîs/: ناو. ئاریکاری هێزی چەکداری دەوڵەتی ☰ نیروهای مردمی

**ملیوان** / m(i)lîwan/: ناو. ملشۆ؛ ملوان؛ ملەوانە؛ پێسیر؛ قەمت ☰ یقه

**ملیوانە** / m(i)lîwane/: ☜ ملوانکە

**ملیۆن**[۱] / milyon/: ناو. ملوێن؛ میلیۆن؛ دووکلوور؛ هەزار جار هەزار؛ ژمارەی تەرتیبی بەرانبەر بە هەزار هەزار ($10^6$) ☰ میلیون

**ملیۆن**[۲]: ئاوەڵناو. ملوێن؛ میلیۆن: ۱. بە ڕێژە و ئەندازەی ملیۆن ۲. بە جێگا، ڕیز یان پلەی ملیۆن ☰ ۱و۲. میلیون

**ملیۆنر** / milyonir/: ئاوەڵناو. ملوێنەر؛ ملوێنێر؛ مایەوەر؛ دارا؛ ساماندار؛ مایەبۆش؛ دەوڵەمەند؛ دەوڵەمەن؛ بە ماڵ و سامانێک ئەوەندەی یەک یان چەند ملیۆن ☰ میلیونر

**ملێب** / m(i)lêb/: ☜ ملهێب

**ملێبۆک** / m(i)lêbok/: ناو. چنگاڵ؛ چەتاڵی هەوالی کەوچک ☰ چنگال غذاخوری

**ملێملێ** / m(i)lêm(i)lê/: ☜ ملانێ

**مڵ**[۱] / mił/: ناو. ۱. ڕەڵم؛ ڕەمڵ؛ لیم؛ لم ۲. ☜ مشک ـ۱ ۳. ملە؛ جۆبرک؛ قاژنگە ☰ ۱. ریگ ۲. ☜ مشک ـ۱ ۳. آبدُزدک

**مڵ**[۲]: ئاوەڵناو. ۱. بڵ؛ نەرمی خراپ ۲. زۆر ورد و نەرم کە دەبێتە تۆلا ☰ ۱. لهیده ۲. بسیار نرم و بە هم چسبیده

**مڵ**[۳]: لێل. ← مڵومۆ ـ مڵوموش

**مڵاز** / m(i)łaz/: ☜ مەلاز

**مڵاژگ** / m(i)łajig/: ☜ مەلاشو

**مڵاژی** / m(i)łajî/: ☜ مەلاشو

**مڵاسکەمڵاسک** / m(i)łaskem(i)łask/: ناو. مڵ‌ومۆ؛ ڕەوتی گەڕان و بۆن کردنی سەگ ☰ عمل گشتن و بو کشیدن سگ

**مڵاسەکوتێ** / m(i)łasekutê/: ناو. چاوشارەکێ؛ چاوشارکێ ☰ قایم‌موشک

**مڵاشک** / m(i)łaş(i)k/: ☜ مەلاشو

**مڵاک** / m(i)łak/: ناو. ۱. کەچک؛ کەوچک؛ کەفچی ۲. مێلاک؛ چەژە؛ چێشکە ☰ ۱. قاشق ۲. عمل چشیدن

**مڵاکۆکە** / m(i)łakoke/: ناو. کەوچکی چکۆلە ☰ قاشق کوچک

**مڵاییژە** / m(i)łayîje/: ☜ مەلاشو

**مڵت** / miłt/: ناو. ملتە؛ تڵتە؛ خلتە ☰ تُفالە؛ تەنشین

**مڵتە** / miłte/: ☜ مڵت

**مڵچ** / miłç/: دەنگەناو. مرچ؛ مرچە؛ میرچ: ۱.

دەنگی زار لە خواردندا ٢. دەنگی ڕامووسان ٣. دەنگی ئاو بە زمان هەڵکێشان و خواردنەوەی ☰ ١. ملچ‌ملوچ ٢. ماچ؛ صدای بوسه ٣. صدای برکشیدن مایع با زبان

**ملچاندن** / mılçandin/: چاوگ. ملچانن؛ ملچنای؛ مرچ کردن؛ دەنگ لە دەم هاتن لە کاتی خواردن و خواردنەوەدا ☰ ملچ‌ملوچ کردن

**ملچنای** / mılçnay/: ☜ **ملچاندن**

**ملچە** / mılçe/: دەنگەناو. دەنگی دەم لە کاتی خواردن و خواردنەوە ☰ صدای دهان هنگام خوردن و نوشیدن

**ملچەملچ** / mılçemılç/: دەنگەناو. ملچەی زۆر ☰ ملچ ـ مولوچ

**ملس** / mıls/: ☜ **مێش ـ١**

**ملغە** / mılğe/: ☜ **مەلغە**

**ملق** / mılq/: ناو. فیز؛ دەعیە؛ دەمار ☰ تکبر

▣ **ملق بە خۆوە نان:** خۆ گرتن؛ دەعیە و دەمار نواندن ☰ تکبر نشان دادن

**ملقە** / mılqe/: دەنگەناو. دەنگی گەروو کاتی تراو خواردنەوە ☰ صدای گلو هنگام سر کشیدن مایع

**ملک** / mılk/: ناو. ١. زەمینی تایبەتی ٢. ماڵ؛ خانوو ☰ ١. ملک ٢. خانه

**ملکانە** / mılkane/: ناو. داهاتی خاوەن زەمین لە ڕەعیەتان ‹بە دەستی خۆی ملکانەی بۆ ئاغا کۆ دەکردەوە› ☰ بهرەی مالکانه

**ملکنای** / mılknay/: ☜ **مژین**

**ملوچە** / m(i)łuçe/: ئاوەڵناو. گلۆفاو؛ لە ناو مشتدا گوشراو ☰ مُچاله

**ملومۆ** / mił û mo/: ناو. ملومووش؛ کاری گەڕان و بۆن کردن بۆ دۆزینەوەی خواردەمەنی ‹عامفەرەم پیرۆت! زانیت، خۆیەسی/ ڕێوی بۆ سیرمە ملومۆیەسی «هەژار، بۆ کوردستان»› ☰ عمل بو کشیدن و دنبال خوراکی گشتن

▣ **ملومۆ کردن:** بۆ کردن و گەڕان بە دوای خواردەمەنیدا هەروەها: **ملومۆ بوون** ☰ بو کشیدن و دنبال خوراکی گشتن

**ملوموچ** / mił û mûç/: ☜ **مرومۆچ**

**ملوموش** / mił û mûş/: ☜ **ملومۆ**

**ملۆ** / m(i)ło/: ☜ **مەلۆ**

**ملۆچە**[١] / m(i)łoçe/: ☜ **مرۆچانە**

**ملۆچە**[٢]: ☜ **مچۆلە**

**ملۆزم** / m(i)łozim/: ناو. ١. *[باوەڕی کۆن]* جنۆکەی پیاوترسێن ٢. *[مەجازی]* زیت؛ دژ؛ دوژمن ‹ئاڵ و شەوە ملۆزمی منداڵ و ئافرەتی زەیستانن› ٣. مێمل؛ زاوڵ ☰ ١. جن ٢. دشمن ٣. آفت؛ مزاحم

▣ **بوونە ملۆزم:** دژایەتی شتێ کردن و نەهێشتنی ‹گیاکەلە بۆتە ملۆزمی تووتنەکە و ناهێڵێ بالا بکا› ☰ بلای جان شدن

**ملۆسنای** / m(i)łosnay/: چاوگ. مژین؛ ملک لێ دان ☰ مکیدن

**ملۆسنایش** / m(i)łosnayîş/: چاوگ. ١. ☜ مژین ٢. کێشان بەرەو خۆ ☰ ١. ☜ **مژین** ٢. جذب کردن

**ملۆمە**[١] / m(i)łome/: ناو. داری دوڕ بەردی دەستاڕ ☰ چوب وسط دستاس زیرین

**ملۆمە**[٢]: ئاوەڵناو. گرمۆڵە ☰ مُچاله

**ملە** / m(i)łe/: ناو. ١. جۆبڕک ٢. ☜ **مشک ـ١** ☰ ١. آبدُزدک ٢. ☜ **مشک ـ١**

**ملەما** / m(i)łema/: ناو. ١. قەڵشی بابوێر ٢. پارچە و پەڕۆی بە زەردێنە هێلکە سواغ‌دراو بۆ سەر برین ‹شانە شانای تای توڕڕەی وەرزاخان/ ملەمای بالای نەوتوول باخان «مەولەوی»› ☰ ١. سوراخ منفذ باد ٢. مُشمع از زردەی تخم‌مرغ

▣ **ملەما لێ برین:** ملەما لێ چنین؛ کون‌بڕ کردن ☰ منفذ بُریدن

**ملەما لێچنین:** ☜ **ملەما لێ‌برین**

**ملێس** / m(i)łês/: ئاوەڵناو. هێدی؛ ئارام ☰ آرام

**ممبارک** / mimbarek/: ☜ **موبارەك**

**ممبارەک** / mimbarek/: ☜ **موبارەك**

**ممبارەکبادی** / mimbarekbadî/: ☜ **موبارەکبایی**

**ممبارەکی** / mimbarekî/: ☜ **موبارەکی**

**من**[1] / min/: ☜ **مەن**[1]

**من**[2]: جێناو. ئەمن؛ مە؛ ئـەم؛ ئـەز؛ مـو؛ م؛ جێنـاوی تاکی وێژەر ☰ من

**مناجات** / m(i)nacat/: نـاو. نزا؛ سەلا؛ کـەبار؛ ڕاز و نیاز؛ کازکاز: ۱. کاری لالانەوە لە خودا و سـپاس و پێزانینی خۆ دەربڕین ۲. ئەو شیعر و دۆعایانەی بەم مەبەستەوە دەگوترێن ☰ ۱و۲. مُناجات

**منارە** / m(i)nare/: ناو. مەنارە؛ بینایەکی گرۆڤەری هەڵچوو وەکوو بەشێک لە مزگەوتان بۆ بانگ لـە سەر دان ‹منارەکەی خانەقا؛ هـەولێر شـاری قـەلا و منارە› ☰ منارە

**مناسب** / m(i)nasib/: ئاوەڵـناو. شـیاو؛ لـەبار ☰ مُناسب

**منافق** / m(i)nafiq/: نـاو. دووڕوو؛ ڕووبین؛ ناڕاست؛ دوڕاز؛ دووقوون؛ قەفراخ؛ فـرەڕوو؛ حـەفتڕەنـگ؛ هۆکارە و هۆگری دووڕوویی ☰ مُنافق

**مناڵ** / m(i)nał/: ☜ **منداڵ**

◘ **مناڵ بون**: ☜ **منداڵ بوون**

**مناڵ هێنان**: بوونە خاوەن منداڵ ☰ بچەدار شدن

**مناڵانە** / m(i)nałane/: ☜ **منداڵانە**

**مناڵبـار** / m(i)nałbar/: ئاوەڵـناو. خێزانبـار؛ ژن و منالدار ☰ عیالوار

**مناڵباز** / m(i)nałbaz/: ☜ **منداڵباز**

**مناڵبازی** / m(i)nałbazî/: ☜ **منداڵبازی**

**مناڵترسـێن** / m(i)nałtirsên/: نـاو. خۆخولـێ؛ شەولەبان؛ ئاشەگوێرێژ ☰ لولو؛ بچەترسان

**مناڵدار** / m(i)nałdar/: ☜ **منداڵدار**

**مناڵدان** / m(i)nałdan/: ☜ **منداڵدان**

**مناڵکار** / m(i)nałkar/: ☜ **منداڵکار**

**منـــاڵمردو** / m(i)nałmirdû/: ئاوەڵـــــناو. جگەرسووتاو؛ زکسووتاو ☰ فرزندمردە

**مناڵوکـاڵ** / m(i)nał û kał/: ناو. *[کینایە]* **مناڵوکـاڵ** منداڵوکـاڵ؛ مندارومـەزن؛ ڕەشوڕووت؛ ڕووت و ڕەجالە؛ خەڵکی بێسەروپا ☰ رجالە

**مناڵومەزن** / m(i)nał û mezin/: ☜ **مناڵوکاڵ**

**مناڵۆچکە** / m(i)nałoçke/: ☜ **منداڵۆچکە**

**مناڵەبەر** / m(i)nałeber/: ☜ **منداڵەبەر**

**مناڵەڕەش** / m(i)nałeřeş/: نـاو. سیپەلە؛ سـیپەرە؛ باوەشێنە؛ سەفرابەر؛ گیای سیپەلە ☰ سرخس

**مناڵەورتکە** / m(i)nałewirtke/: ☜ **منداڵەورتکە**

**مناڵەورکە** / m(i)nałwirke/: ☜ **منداڵەورتکە**

**مناڵی** / m(i)nałî/: ☜ **منداڵی**

**منامنا** / m(i)nam(i)na/: ئاوەڵـناو. دیـار و ئاشـکرا؛ خویا ☰ نمایان

**منبارەک** / minbarek/: ☜ **موبارەك**

**منتک** / mintik/: ناو. نمتک؛ تەڕایی ‹گـۆزە منتـک دەدا› ☰ تراوش

◘ **منتک دان**: دەلاندن؛ شێ دانەوە ☰ نم پس دادن

**منج** / minc/: ناو. ۱. توو؛ تۆو؛ تۆم ۲. پنج؛ بـن ۳. ☜ **مینج** ☰ ۱. بذر ۲. بوتە ۳. ☜ **مینج**

**منجـڕ** / minciř/: ئاوەڵـناو. *[کینایـە]* ۱. سمـــنج؛ تایبەتمەندی کەسێ کە پێوە دەنووسێ و لە کۆڵ نابێتەوە ‹منداڵێکی منجڕ و لاسار بووم› ۲. فرەوێژ؛ چەنەباز ۳. تایبەتمەندی پشـیلەی زیانـەخورۆ ☰ ۱. سِمج ۲. وراج ۳. ویژگی گربەای کە زیان میزند

**منجڵ** / mincił/: نـاو. منجەڵە؛ پەڵـە پەڵـەی بـاقر بوونی مس ☰ لکەهای روی ظروف مسین

**منجە** / mince/: دەنگەناو. دەنگـی گـن ☰ صـدای تودماغی

◘ **منجە هاتن**: ☜ **منجەمنج کردن**

**منجەڵە** / mincełe/: ☜ **منجڵ**

**منجەمنج**[1] / mincemine/: ناو. *[کینایە]* نـارەزایی ≡ ناخشنودی

▣ **منجەمنج کردن:** منجـە هـاتن؛ نـارەزا بـوون لـە کاریَ بەتایبەت لە مامەڵەدا ≡ ناخشـنود بـودن، بە ویژه در مُعامله

**منجەمنج**[2]: ☜ منگەمنگ

**منـدار / mindar/**: نـاو. ١. ☜ منـــداڵ ٢. ☜ مردار[1]ـ١

▣ **مندار بوونەوە:** ☜ مردار بوونەوە

**مندار کردنەوە:** ☜ مردار کردن

**مندارانە / mindarane/**: ☜ منداڵانە

**مندارباز / mindarbaz/**: ☜ منداڵباز

**منداربازاڕ / mindarbazař/**: ☜ منداڵبازاڕی

**منداربازاڕی / mindarbazařî/**: ☜ منداڵبازاڕی

**مندارbازی / mindarbazî/**: ☜ منداڵبازی

**منداردان / mindardan/**: ☜ منداڵدان

**مندارومەزن / mindar û mezin/**: ☜ مناڵوکاڵ

**مندارەمانگ / mindaremang/**: ناو. مانگی نەخۆش کەوتن و مردارەوە بوونی پەز ≡ مـاهی کـە در آن گوسفندان بیمار می‌شوند و می‌میرند

**مندارەورتکە / mindarewirtke/**: ☜ منداڵەورتکە

**مندارەوەبوو / mindarewebû/**: ☜ مردارەوەبوو

**منـداری / mindarî/**: نـاو. ١. ☜ منـــداڵی ٢. چۆنیەتی مردارەوە بوون ٣. پیسی؛ گـلاوی ≡ ١. ☜ منداڵی ٢. مُرداری ٣. پلیدی

**منـداڵ**[1] / mindał/: نـاو. منـاڵ؛ منـدار؛ مەنـداڵ؛ مەندال: ١. فرزەند؛ ڕۆڵە ‹سێ منداڵـم هـەن، دوو کـچ و کـوڕێ؟› ٢. بەچکـە؛ بێچـوو؛ پسـانک؛ گیانداری پێنەگەیشتوو ‹منداڵی فیـل› ٣. زارۆک ‹تا منداڵی کاڵـی› ٤. خەڵـک؛ خەڵـکی شـوێنێ ‹منداڵی کـوێی؟› ٥. هاوکـار؛ کەسـانی هاوتـەراز تایبـەت بـە گـرۆ یـان ڕێکخراوەیـەک ‹هـەموو منداڵەکانی ئیدارە دەزانـن› ≡ ١. فرزنـد ٢. بچـە ٣. کودک ۴. بچه؛ اهل ۵. بچه

▣ **منداڵ بوون:** منـاڵ بـوون: ١. زایـین؛ بـە دنیـا هێنانی منداڵ ‹شوکر خوشکم منداڵی بووە!› ٢. منداڵ هەبوون؛ خاوەن مناڵ بوون ‹لەو شووەی دوو منداڵی هەیـە› ٣. کـەمتەمـەن بـوون؛ لـە سەردەمی منداڵیدا بوون ‹هێشتا منـداڵ بـووم، بابم فەوتی کرد› ≡ ١. زاییدن ٢. بچـە داشـتن ٣. بچه بودن

**منداڵ خستنەوە:** *[کینایە، پلار]* خسـتنەوە؛ منـداڵ هێنان ≡ پس انداختن

**منداڵ**[2]: ئاوەڵناو. مناڵ؛ مندار؛ مەنداڵ؛ مەنـدال: ١. کەمتەمەن ‹کوڕەکەی هێشتا منداڵە› ٢. *[مەجازی]* خاو؛ کرچ و کاڵ و گەوج ‹دیـارە زۆر منداڵـی!› ≡ ١. کم‌سن و سال ٢. بچه

**منداڵانە**[1] / mindałane/: ئاوەڵناو. مناڵانە؛ مندارانە؛ زاوڵانە؛ زاروانە؛ زارۆڵانە؛ بەچانـە: ١. پێوەندیـدار یان سـەبارەت بـە منـداڵ ‹بـەرگی منداڵانـە› ٢. *[مەجازی]* خاو؛ کرچ و کـاڵ یـان گەوجانـە ‹بـیری منداڵانە› ≡ ١و٢. بچه‌گانه

**منداڵانە**[2]: ئاوەڵکار. مناڵانـە؛ مندارانـە؛ زاوڵانـە؛ بەچانە؛ وەکوو منداڵان ‹منداڵانە قسـە مەکـە!› ≡ بچه‌گانه

**منداڵباز / mindałbaz/**: ئاوەڵناو. *[ناشیرین]* مناڵـباز؛ مندارباز؛ بەچەباز؛ لووسکەباز ≡ بچه‌باز

**منداڵبازاڕ / mindałbazař/**: ناو. منداربازاڕ؛ کـار و بـڕیاری کـرچ و کـاڵ و نـەگونجاو. هـەروەها: **منداڵبازاڕی** ≡ کار بچه‌گانه

**منـداڵبازی / mindałbazî/**: نـاو. مناڵـبازی؛ مندارbازی: ١. *[ناشیرین]* بەچـەبازی؛ لووسـکەبازی ٢. کاری بنشڕ و نەگونجاو ≡ ١و٢. بچه‌بازی

**منداڵدار / mindałdar/**: ئاوەڵناو. مناڵدار؛ زاوڵەدار؛ خودان زارۆ ≡ بچه‌دار

**منداڵـداری / mindałdarî/**: ئاوەڵـناو. منـاڵداری؛

زاولـەداری؛ ڕاهێنان و بار هێنانی منداڵ 🇮🇷 بچەداری

**مندالّدان** / mindałdan/: ناو. منالّدان؛ منداردان؛ جێگەی پیزە لە زگدا 🇮🇷 زهدان

**مندالّکار** / mindałkar/: ناو. منالّکار؛ منالّسالّ؛ کەمتەمەن ‹یەکێکی مندالّکاری خوێنشیرین قسەی دەکرد› 🇮🇷 بچەسال

**مندالّلەبەر** / mindałleber/: ☜ **مندالّەبەر**

**مندالّوکالّ** / mindał û kał/: ☜ **منالّوکالّ**

**مندالّۆچکە** / mindałoçke/: ناو. منالّۆچکە؛ مندالّۆک؛ مندالّۆکە؛ زارۆی پچووک 🇮🇷 بچەی کوچولو

**مندالّۆک** / mindałok/: ☜ **مندالّۆچکە**

**مندالّۆکە** / mindałoke/: ☜ **مندالّۆچکە**

**مندالّەبەر** / mindałeber/: ئاوەلّناو. منالّەبەر؛ مندالّلەبەر؛ تایبەتمەندی ژنێ کە مندالّی چکۆلەی هەیە ‹ژنی مندالەبەر لایەکی هی خۆی نییە!› 🇮🇷 ویژگی زنی کە بچەی شیرخوارە دارد

**مندالّەورتکە** / mindałewirtke/: ناو. منالّەورتکە؛ منالەورکە؛ مندارەورتکە؛ مندالەورکە؛ پچووک و زارۆی کۆلان 🇮🇷 بچەهای قدونیمقد

**مندالّەورکە** / mindałewirke/: ☜ **مندالّەورتکە**

**مندالّی** / mindałî/: ناو. منالّی؛ منداری؛ زاولەیی؛ زارۆلەیی: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی منالّ بوون ۲. ڕۆژگاری زارۆکی؛ سەردەمی مندالّی 🇮🇷 ۱و۲. بچگی

**منسکلّ** / miniskił/: ناو. سەندەلّی؛ سەنگەلّی؛ سەنەلّی 🇮🇷 صندلی

**منکیر** / minkîr/: ئاوەلّناو. دژی شێخی تەریقەت 🇮🇷 مُنکر پیر طریقت

**منگ** / ming/: دەنگەناو. منجە؛ قسەی لە کەپۆ 🇮🇷 صدای تودماغی

**منگاندن** / mingandin/: چاوگ. گن قسە کردن 🇮🇷 تودماغی حرف زدن

**منگن** / mingin/: ئاوەلّناو. گن 🇮🇷 ویژگی کسی‌کە تودماغی حرف می‌زند

**منگنای** / mingnay/: چاوگ. بە گنی دوان 🇮🇷 تودماغی حرف زدن

**منگنی** / ming(i)nî/: ناو. گنی؛ قسەی بە مینگە 🇮🇷 تودماغی (سُخن)

**منگە** / minge/: دەنگەناو. منگ؛ مینگە 🇮🇷 حرف تودماغی

**منگەمنگ** / mingeming/: دەنگەناو. منجەمنج؛ منگەی لە دووی یەک 🇮🇷 عمل حرف زدن تودماغی

**منمن** / minmin/: ناو. منەمن؛ لافوگەزاف؛ قسەی خۆبەزلزان 🇮🇷 خودستائی

**منمنک** / minm(i)nik/: ناو. ۱. پەپوولە ۲. ☜ **منمنۆک ـ۱** 🇮🇷 ۱. پروانە ۲. ☜ **منمنۆک ـ۱**

**منمن و تۆتۆ** / min min û to to/: ناو. کێشەوهەرا لە سەر کردنی کارێ یان لە سەر خاوەنیەتی شتێک ‹ئەم منمن و تۆتۆەی ناوێ، مالّی خۆت بۆ خۆت، مالّی خۆم بۆ خۆم›. هەروەها: **منمن و تۆتۆ کردن** 🇮🇷 مُنازعە

**منمنۆک** / minm(i)nok/: ناو. ۱. منمنک؛ جۆرێ پەپوولەی خالّدار ۲. خۆپەسندی 🇮🇷 ۱. نوعی پروانەی خالدار ۲. خودستایی

**منمنە** / minm(i)ne/: ناو. زەنگیانە 🇮🇷 منجوق

**منوتۆیی** / min û toyî/: ناو. لێکجیایی؛ فەرق و جیاوازی ‹دەست لەم منوتۆیی و دوژمنییە هەلّگرن!› 🇮🇷 فرق

**منۆلّ** / m(i)noł/: ناو. پارچەیەکی ئەستوور و قایمە 🇮🇷 پارچەای مُحکم

**منە** / m(i)ne/: ناو. ۱. ☜ **منەت** ۲. زۆر بەتاوات بوون و پەلە و لەز بۆ کارێک ۳. *[مندالانە]* مووروو 🇮🇷 ۱. ☜ **منەت** ۲. بیتاب در انجام کاری ۳. مُهرەی زینتی

⊡ **منە کردن:** هەڵپە کردن و ئاواتەخواز بوون بۆ کردنی کارێ ‹بانگی کەم هەر منە دەکا› ☰ بە سر دویدن

**منەت** / m(i)net/: ناو. منە؛ چکی ‹گۆشتی رانی خۆت بخۆ، منەتی قەساب هەڵمەگرە! «مەسەل»› ☰ منت

⊡ **منەت بردن:** ١. مەمنوون بوون ٢. حەز کردن ☰ ١. سپاسگزار بودن ٢. مُشتاق بودن

**منەت بە سەردا کردن:** منەت نانە سەر کەسێ ‹هیچ هەقم نییە منەتیان بە سەردا بکەم «هێمن»› ☰ منت بر کسی نهادن

**منەت خوارن:** منەتبار بوون ☰ سپاسگزار بودن

**منەت کێشان:** منەت هەڵگرتن؛ داوا کردنی شتێک لە کەسێک بە نابەدڵی و لە سەر ناچاری وێڕای سووک بوون ‹مەینەت کیشان باشترە لە منەت کێشان «مەسەل»› ☰ منّت کشیدن

**منەت لە سەر نان:** منەت نانە سەر؛ منەت بە سەردا کردن؛ چاکە و خزمەت بە چاودا دانەوە ‹تۆ منەتی ئەو چاکەیەم لە سەر دەنێی، کە تۆرەمەی ئیسرائیلت کردۆتە عەبدی خۆت؟! «هەژار، *قورئان*»› ☰ منّت نهادن

**منەت نانە سەر کەسێ:** ☜ **منەت لە سەر نان**

**منەت هەبوون:** منەتبار بوون ☰ رهین منت بودن

**منەت هەڵگرتن:** ☜ **منەت کێشان**

**منەتی کەس/ شتێک زانین:** پێزانین؛ قەدری چاکە و باشی کەس/ شتێک گرتن ‹منەتی ئەو کارەی دەزانم› ☰ منت کسی/ چیزی را داشتن

**منەتبار** / m(i)netbar/: ئاوەڵناو. منەتدار: ١. سوپاسگوزار ‹زەمین منەتبار پا نیا و مەویەرد/ جار جار وە ڕووی ناز باوەشێن مەکەرد «مەولەوی»› ٢. قەرزار؛ وامدار ‹تا کەی منەتباری دەستی ئەم و ئەو بین؟› ☰ ١. مدیون ٢. بدهکار

**منەتباری** / m(i)netbarî/: ناو. دۆخ یان چۆنیەتی منەتبار بوون ☰ مدیونی

**منەتدار** / m(i)netdar/: ☜ **منەتبار**

**منەتکار** / m(i)netkar/: ئاوەڵناو. مەمنوون؛ منەتبار؛ سوپاسگوزار ☰ سپاسگزار

**منەتکێش** / m(i)netkêş/: ئاوەڵناو. چاوبەرەژێر؛ تایبەتمەندی ئەوەی بە کزی دەچێتە پێش بۆ ئاشت بوونەوە. هەروەها: **منەتکێشی** ☰ منت‌کش

**منەقا** / m(i)neqa/: ناو. جۆرێ ترێ ☰ نوعی انگور

**منەمن** / m(i)nemin/: ناو. ١. ☜ **منمن** ٢. منەمنە؛ بۆڵە و پرتە ☰ ١. ☜ **منمن** ٢. غرولند

**منەمنە** / m(i)nem(i)ne/: ☜ **منەمن ـ٢**

**منەوشە** / m(i)newşe/: ناو. وەنەوشە ☰ گل بنفشه

**منەیی** / m(i)neyî/: ناو. پەلە لە ڕێگای دەس خستنی شتێکا ☰ شتاب در راه تحصیل چیزی

**منهۆ** / minho/: ناو. مەتن؛ نووسراوی ناو کتێب ☰ متن کتاب

**منێ**[1] / m(i)nê/: ناو. کار و ڕەوتی تۆژینەوە؛ لێکۆڵینەوە ☰ پژوهش؛ کندوکاو

⊡ **منێ کرن:** تۆژینەوە؛ هلکەوشاندن ☰ تحقیق کردن؛ پژوهش کردن

**منێ**[2]: ئاوەڵناو. خۆیا؛ بەرچاو ☰ آشکار؛ نمایان

**منێکار** / m(i)nêkar/: ناو. تۆژەرەوە؛ شیکەرەوە ☰ پژوهشگر

**منێمنێ** / m(i)nêm(i)nê/: ناو. زەنگیانە ☰ منجوق

**مو** / mu/: جێناو. من؛ ئەمن؛ ئەز ☰ من

**مواجب** / m(i)wacib/: ☜ **مووچە ـ١**

**موارەک** / m(i)warek/: ☜ **موبارەك**

**موارەکبادی** / m(i)warekbadî/: ☜ **موبارەکبایی**

**موانە** / m(i)wane/: ناو. بەرەمۆم؛ خشتوخاڵی ناو پلۆرەمێش ☰ آشغال کندوی عسل

**موانەت** / m(i)wanet/: ناو. دەرفەت؛ مۆڵەت ‹ئەجەل موانەتی نەدا و کوژرا› ☰ مُهلت

**موبــــارەک** / mubarek/: ئاوەڵـــناو. ممبـــــارەک؛ ممبارک؛ مبارەک؛ منبارەک؛ مـوارەک؛ مـارەک؛ پـیرۆز؛ جـەخت؛ فـەرخ؛ هـەزەخ؛ هـات؛ بەفـەڕ ‹زەفافەتگاهی پەردەی ئالی چاوم/ موبارەک حەجلـە بێ بۆ بووک و زاوا «نالی»› ▤ مُبارک

**موبارەکبـایی** / mubarekbayî/: نـاو. مبارەکبـادی؛ مبارەکبـــایی؛ ممبارەکبـــادی؛ موارەکبـــادی؛ پیرۆزبایی ▤ تبریک

**موبارەکی** / mubarekî/: ناو. ممبارەکی؛ مبارەکی؛ پیرۆزی ▤ مبارکی

**موباشیر** / mubaşîr/: نـاو. مباشـیر؛ مـۆ؛ گزیـر؛ پێشکار ▤ مباشر

**موبل** / mubl/: نـاو. قەنەفـە؛ جۆرێـک سەندەڵـی ڕاحەت بە دۆشەکی نەرمی فەنەردار و دەسکی لە چێو یان لە هەور و پووشاڵەوە ▤ مُبل

**موبەق** / mubeq/: ناو. کلەر؛ مدبەق ▤ مطبخ

**موتـاڵا** / mutała/: ناو. متالا؛ کـاری خوێندنـەوەی زۆرتر بێدەنگ و هەر بە چاو ‹من کـە دڵ دایم نـە واوەیلمـــەن/ غـــەرقی موتـــالای خالـــی لەیلمـــەن «مەولەوی»› ▤ مُطالعه

**موتر** / mutir/: ☜ موتور

**موتریب** / mutrîb/: نـاو. ســازژەن؛ ســازلێدەر ‹موتریبان وە سۆز سەدای سازەوە/ خـۆش‌خوانـان وە لەحن خۆش‌ئاوازەوە «خانای قوبادی»› ▤ مُطرب

**موتـور** / mutur/: نـاو. مـاتۆر؛ مۆتـۆر؛ مـوتر: ١. بەشێک لە ماشـین کـە هێـزی جووڵـە بەرهـەم دێنێ ‹وەکوو بەشێکی وا لە ئوتومبیل، ئیلکترۆموتور و پـومپی ئـاودا› ٢. موتورسـیکلێت ▤ ١. موتـور ٢. موتورسیکلت

**موتوربە** / muturbe/: نـاو. متربە؛ موتورفە؛ متورفە؛ متوربە؛ پەیوەندی دار ‹نەخل و ڕوممان پێکـەوەن، یا باغەبان وەی کردووە/ سەروی هێنـاوە لـە سـێو و بەی موتوربەی کردووە! «نالی»› ▤ پیوند درخت

**موتورفە**[1] / muturfe/: ☜ موتوربە

**موتورفە**[2]: ئاوەڵناو. متورفە؛ زۆر جوان و بێ‌هاوتا ▤ بسیار زیبا و بی‌همتا

**موتۆرسـیکلێت** / mutorsîklêt/: نـاو. تڕتــــڕە ▤ موتورسیکلت

**موجەسەمە** / muceseme/: ناو. پەیکەر؛ کۆتـەڵ ▤ تندیس

**موچرک** / muçiř(i)k/: ☜ مچوڕك

**موچەوانە** / muçewane/: ☜ موچەوانە

**موچیا** / muçya/: ناو. جومگەی پا ▤ مُچ پا

**موچین** / muçîn/: ناو. جومگە پێچ ▤ مُچ پیچ

**موحاریب** / muĥarîb/: نـاو. *[ئیسلام]* ئـەوەی دژی حکوومەتی ئیسلامی چەک هەڵـدەگرێ و شـەڕ دەکا ▤ مُحارب

**موحبەت** / muĥibet/: ☜ مۆڤەت

**موحتاج** / muĥtac/: ناو. ئەوەجە؛ ئاتـاج؛ بـەنیاز ▤ مُحتاج

**موحتەرەم** / muĥterem/: ئاوەڵناو. بەڕێز و بە قـەدر ‹بێزارە لە تۆ ئێستە، هەماغووشی عەدووتە/ دونیا کـە دوێنێ حەرەمی موحتەرەمت بوو! «نالی»› ▤ مُحترم

**موحەللەق** / muĥelleq/: ☜ محەلەق

**موحەلەق** / muĥeleq/: ☜ محەلەق

**موحەننەک** / muĥennek/: ☜ محەنەك

**موخ** / mux/: نـاو. ١. ☜ مێشـك ـ١ ٢. مـژی نـاو ئێسکی ئەندام ▤ ١. ☜ مێشك ـ١ ٢. مغز استخوان

**موخـابن** / muxabin/: سارستە. مخـابن؛ حـەیف؛ بەداخەوە ▤ دریغا

**موختەسـەر** / muxteser/: ئاوەڵـــناو. کورتــــــە؛ کورتەوەکراو ▤ مُختصر

**موخل** / muxil/: ناو. کەوگیر ▤ کفگیر

**مـوخلیس** / muxlîs/: ئاوەڵـناو. خزمــەتکاری بــە ئەمەگ ▤ مُخلص

**موخڵ** / muxił/: نـاو. جۆگـە؛ هێڵـەگ ▤ الـک

ئاردبیزی

**موخورب** / muxurb/: ☜ **مەغریب**

**موخوڕ** / muxuř/: ناو. دەمووکانە؛ دەنوکە ⇆ دبق؛ مویزک

**مودیر** / mudîr/: ☜ **مدیر**

**مورت** / murt/: ناو. ١. تووکەبەر؛ مووی بەر گەدە ٢. ئەو وردە مووە لە پێستەی دەڕنن ⇆ ١. موی زهار ٢. ریزه مویی که از پوست حیوان برکنند

**مورتاز** / murtaz/: ناو. ئەوەی تاڵی و سوێری دەخاتە بەر خۆی تا دڵ و دەروونی بگەشێتەوە، بەتایبەت شوێنکەوتوانی ئایینی هیندوو ⇆ مُرتاض

**مورتخە** / murt(i)xe/: ☜ **مۆرەغە**

**مورد** / murd/: ☜ **موورتك**

**مورداد** / murdad/: ناو. گەلاوێژ؛ مانگ گاقوڕ؛ ناوەڕاستمانگی هاوین ⇆ مُرداد ماه

**موردار** / murdar/: ☜ **مردار**[1]**ـ١**

**مورشید** / murşîd/: ناو. مرشۆد؛ موڕشید؛ مرشید؛ مرشید: ١. پیر؛ شێخی تەریقەت؛ پێشەوا، بەتایبەت پێشەنگی تاقمێ سۆفی ٢. مرشۆر؛ بەڕێوەبەر یان کارگێڕی وەرزشی لە زۆرخانەدا ⇆ ١. پیر طریقت ٢. مُرشد زورخانه

**مورفین** / murfîn/: ناو. ئاڵکالوییدێکی گرینگی خەشخاشە کە سڕکەر و ژانبڕە ⇆ مُرفین

**موروان** / murwan/: ناو. باڵداران ⇆ مُرغان

**مورونچە** / murunçe/: ناو. ویسر؛ یوسر؛ چێوی دارێکی ڕەنگ ڕەشە تەسبێحی لێ دروست دەکەن ⇆ یُسر

**موروژیان** / murûjyan/: چاوگ. مرۆژانە کردن ⇆ مور ـ مور شدن

**مورەبا** / mureba/: ☜ **مرەبا**

**مورەتخە** / muretxe/: ☜ **مۆرەغە**

**مورەغە** / mureğe/: ☜ **مۆرەغە**

**مورید** / murîd/: ☜ **مرید**

**موریژ** / murîj/: ناو. تاوە؛ تابە ⇆ ماهیتابه

**موریە** / murye/: ☜ **هەرمێ**

**مورێش** / murêş/: ☜ **مورێشی**

**مورێشی** / murêşî/: ناو. مورێش؛ گەنمە بەهاروو ⇆ گندم بهاره

**موڕ** / muř/: ناو. ئەزوا؛ تاڵیشاری؛ دەرمانێکی ڕەشی زۆر تاڵە ⇆ صبر؛ الوا

**موڕشید** / muřşîd/: ☜ **مورشید**

**موڕین** / muřîn/: چاوگ. بۆڕاندنی گاگەل ⇆ ماغ کشیدن گاوها

**موزاییک** / muzayîk/: ناو. بەردێکی دەستکرد لە سیمان و ڕیخی ڕەنگامە بۆ فەرش کردنی ڕووبەر ⇆ موزاییک

**موژ** / muj/: ☜ **مژ**[1]**ـ١**

**موژدە** / mujde/: ناو. مزگێنی؛ خەبەری خۆش ⇆ مژده

**موژە** / muje/: ناو. بژانگ «هەر یەک بە موژەی سیای مەودایی/ مەشکاوان سینەی بەندەی سەودایی «بێسارانی»» ⇆ مُژه

**موژەلانک** / mujelanik/: ناو. برۆ ⇆ ابرو

**موژین** / mujîn/: ناو. برژانگ ⇆ مُژه

**موس** / mus/: ناو. هەستەرە؛ گوێزان؛ گیزان؛ تیخی مووتاش ⇆ استره

**موسایا** / musaya/: ☜ **موسایا**

**موساینە** / musayne/: چاوگ. فێر کردن؛ دەرز دادان؛ ڕاهێنان ⇆ یاد دادن

**موساییش** / musayîş/: چاوگ. موسنایا؛ موسناییش؛ فێر بوون؛ هەڤۆتن؛ ڕاهاتن ⇆ یاد گرفتن

**موسبەت** / musbet/: ناوەڵناو. ١. *[فیزیک]* خاوەن لێهاتوویی بەرەو لای خۆ کێشانی ئیلکترۆن ٢. ئەرێنی؛ پوزیتیڤ ⇆ ١و٢. مُثبت

**موستەتیل** / mustetîl/: ناو. لاکێش؛ درێژۆکە ☰ مُستطیل

**موستەزاد** / mustezad/: ناو. کلکەدار؛ چەشنێک هۆنراوە کە بە شوێن هەر باڵێکدا کورتەڕستە یان چەند وشە دێت کە لە باری ماناوە جوان دێتەوە بەڵام لە باری کێشەوە زیادییە (وەک: ئەم شیعرەی «نالی»: «ئەی تازە جەوان پیرم و ئوفتادە و کەوتووم// تا ماوە حەیاتم/ دەستێ بدەرە دەستی شکستەم کە لە دەس چووم// قوربانی وەفاتم») ☰ مُستزاد

**موستەفعیلون** / mustef'îlun/: ناو. لە کۆڵەکەکانی کێشی شیعری عەرووزی ☰ مُستفعلن

**موسلوخ** / muslux/: ناو. شێری ئاو؛ بەلووعە ☰ شیر آب

**موسڵمان** / musiłman/: ☜ **موسوڵمان**

**موسموس** / musmus/: ناو. ١. کلکەسووتە و قرووسکەی سەگ بە خۆشەویستی ٢. *[پلار]* زمانلووسی؛ کاری ماستاو کردن و خۆ ڕێک خستن ☰ ١. عمل دم جنباندن و تملق سگ ٢. چاپلوسی

**موسنایا** / musnaya/: ☜ **موسایش**

**موسنایش** / musnayîş/: ☜ **موسایش**

**موسوڵدان** / musułdan/: ☜ **میزەڵدان**

**موسوڵمان**[1] / musułman/: ناو. مسلمان؛ موسلمان؛ هەر یەکە لە شوێنکەوتوانی دینی ئیسلام ☰ مُسلمان

**موسوڵمان**[2]: ئاوەڵناو. مسلمان؛ موسلمان؛ ئاکارچاک؛ باش ‹پیاوێکی موسوڵمانە قەت کاری وا ناکا› ☰ بااخلاق

**موسوڵمانی** / musułmanî/: ☜ **ئیسلامەتی**

**موسەلسەل** / muselsel/: ناو. ڕەشاش؛ شەستیر ☰ آتشبار

**موشان** / muşan/: ☜ **مۆشەن**

**موشانە** / muşane/: ☜ **مۆشەن**

**موشتاخ** / muştax/: ناو. موشتاغ؛ مشتاخ؛ مستاخ؛ جێی هەڵخستن و وشکەوە کردنی میوە لە بەر تاو ☰ جای پهن کردن میوه در آفتاب

**موشتاغ** / muştağ/: ☜ **موشتاخ**

**موشتاق** / muştaq/: ئاوەڵناو. بە تاسە بۆ دیدار ☰ مُشتاق

**موشتولق** / muştuliq/: ناو. مزگێنی؛ شاباشی موژدەی خۆش ☰ مُشتُلُق

**موشکڵ**[1] / muşkił/: ناو. موشکیل؛ گیر و گرفت ‹موشکلی تۆ چییە؟› ☰ مُشکل

**موشکڵ**[2]: ئاوەڵناو. موشکیل؛ دژوار؛ سەخت ‹کارێکی موشکڵ کەوتۆتە بەرمان› ☰ مشکل؛ سخت

**موشکڵ**[3]: ئاوەڵکار. موشکیل؛ بە دژوارییەوە؛ بەسەختی ‹موشکل بتوانین ساغ دەرچین› ☰ مُشکل؛ سخت

**موشکیل** / muşkîl/: ☜ **موشکڵ**

**موشەڕڕەت** / muşeřřet/: ☜ **مشەڕەت**

**موعەرەقکاری** / mu'ereqkarî/: ناو. ١. کاری تاشین و پێکەوە نانی لەتەچێو یان کاشی بۆ داهێنانی نەخشێکی جوان ٢. نەخشێ کە لەو کارە بەرهەم دێ ☰ ١و٢. مُعرقکاری

**موعەللەق** / mu'elleq/: ☜ **محەلەق**

**موعەلەق** / mu'eleq/: ☜ **محەلەق**

**موعەلیم** / mu'elîm/: ☜ **مامۆستا**[1] ـ٢

**موغار** / muğar/: ناو. مغار؛ مکارە؛ تیخێکی دارکۆڵینی نەجارانە ☰ مُغار

**موغارە** / muğare/: ☜ **مەغارە**

**موغاری** / muğarî/: ناو. موغەیری؛ موغێری؛ بوغاری ☰ شومینه

**موغازە** / muğaze/: ☜ **مەغازە**

**موغان** / muğan/: ناو. گای بوغەی ئازا لە کار ☰ گاو مغرور و کاری

**موغموغه** / muğmuğe/: ناو. تەشیکە؛ مێشـوولەی لاقدرێژ کە هەندێکیان سەرپشـتیان کولـکنە ☰ پشّەی بزرگ

**موغه** / muğe/: ناو. بوغە؛ گای قەڵەوی غلـوور ☰ گاو چاق و مغرور

**موغەیری** / muğeyrî/: ☜ موغاری

**موغێری** / muğêrî/: ☜ موغاری

**موفا** / mufa/: ☜ مفا

**موفاجات** / mufacat/: ☜ مفاجات

**موفت** / muft/: ☜ مفتی[2]

**موفتخۆر** / muftxor/: ☜ مفتخۆر

**موفتی** / muftî/: ☜ مفتی[1]

**موفلیس** / muflîs/: ئاوەڵناو. ١. نابووت؛ تێشـکاو ٢. نەدار؛ هەژار ☰ ١. ورشکست ٢. بینوا؛ مُفلس

**موفەتیش** / mufetîş/: ناو. پشکنەر ☰ بازرس

**موقرایی** / muqrayî/: نـاو. کوێرایی؛ لێلایی چاو ☰ نابینایی

◻ **مـوقرایی داهـاتن**: مــوقرایی ڕۆڕژان؛ لێلایــی داهاتن؛ کوێر بوون ☰ نابینا شدن

**موقرایی ڕۆڕژان**: ☜ موقرایی داهاتن

**مـوقری** / muqrî/: نـاو. کـوێری زکمـاک ☰ کـور مادرزاد

**موقور** / muqur/: ناو. مەکر؛ کەلەک؛ فێڵ ☰ حیله

**موقورباز** / muqurbaz/: ئاوەڵـناو. مـەکرباز؛ فێڵـباز ☰ حیلەگر

**موک** / muk/: ئاوەڵـناو. ساق؛ تەواو؛ بێ کەمایەسـی ☰ درست؛ کامل

**موکور** / mukur/: ئاوەڵناو. نەترس؛ ئازا ☰ بی‌باک

**موکوڕ** / mukuř/: ☜ مکوڕ

**موکوڕی** / mukuřî/: ناو. سەربزێوی ☰ یاغیگری

**مولاقات** / mulaqat/: ☜ ملاقات

**مولوکول** / mulukûl/: نـاو. بچـووکترین وردیلـەی تــەنێکی ســاکار یــان تێکــەڵ، کــە هــەموو تایبەتمەندییەکانی ئەو تەنەی تێدا بێ ☰ مولکول

**مولیبدێن** / mulîbdên/: نـاو. تـوخمی شـیمیایی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ٤٢ و کێشی ئـەتومی ٩٥,٩٤ و ڕەنگی خوڵەمێشییەوە کە زۆر قورس و ڕەقە، لە ئاودا ناتوێتەوە و بۆ ڕێختە کردنی پۆڵا بە کار دێ ☰ مولیبدن

**مومـار** / mumar/: ناو. ١. مووی بەژان کە لە قامک دێ ٢. کدوو؛ کرمی درێژی ناو زگ ☰ ١. کژدُمـه ٢. کرم کدو

**موندا** / munda/: نـاو. ١. شاڵ؛ پارچەی شالــی ٢. موندی؛ پشتێن؛ پشتێند ☰ ١. پارچەی مخصـوص شال ٢. شال کمر

◻ **مونـدای ئاشمه**: کەسکەسـۆر؛ کۆلکەزێڕینــە ☰ رنگین‌کمان

**مونــدای حــەزرەتیفاتمــە**: کۆلکەزێڕینـــــــە؛ کەسکەسۆر؛ ئەستوونەزێڕینە ☰ رنگین‌کمان

**مونـدای لاور**: شالی لاهەر؛ شالی کشمیر ☰ شال کشمیری

**موندی** / mundî/: ☜ موندا ـ٢

**مونزر**[1] / munzir/: نـاو. مونزور؛ مزوور؛ خزمەتکاری بەکرێ ☰ خدمتکار روزمُزد

**مونزر**[2]: ئاوەڵناو. مونزور؛ بەهێز و تاقەت ☰ توانا

**مونزور** / munzur/: ☜ مونزر

**مونشی** / munşî/: نـاو. ئینشـابەند؛ سەرقەڵـەم: ١. ئەو کەسە کاروبار و نامەی نووسینگەی سـەرۆک بـەڕێوە دەبـا ٢. ئـەو کەسـەی بـاس و بـڕیاری دانیشتنێک دەنووسێتەوە ☰ ١و٢. مُنشی

**مونک** / munk/: ناو. بەندی قامک ☰ بند انگُشت

**مونیتور** / munîtur/: ناو. شاشە؛ پـەڕەی شـاندانی تەلەڤیزیون، کەمپیوتەر و... ☰ مانیتور

**موه** / m(i)we/: نـاو. ١. مـۆ؛ مـوو؛ پشـتی تـەور و تەشوێ ٢. مووی دەرد کە لە پەنجە دێـت ☰ ١. پُشت تبر و تیشه ٢. کژدُمه

**موەلید** / m(i)welîd/: ناو. ژێنراتۆر؛ جێنەڕاتۆر؛ دینەمۆ ≚ ژنراتور

**موهر** / muhr/: ☜ مۆر[1]ـ١

**موهەندیس** / muhendîs/: ☜ مهەندیس

**موینە** / muyne/: ناو. گیایەکە لە ناو هەرزنجاڕدا دەڕوێ ≚ گیاهی است

**موێش** / m(i)wêş/: ☜ مشكـ١

**مۆ[1]** / mo/: ناو. ١. موە؛ پشتی تەور و تەشوێ ٢. گزیر؛ کاربەدەستی ئاغا و خان ≚ ١. پُشت تبر و تیشە ٢. مُباشر ارباب

**مۆ[2]**: جێناو. من؛ ئەمن ‹مەگەر شێر و پلنگی ئەی دڵ! ئەی دڵ!/ بە مۆ دایم بە جەنگی ئەی دڵ! ئەی دڵ! «باباتاهیر»› ≚ من

**• مۆ[3]**: پاشوشە. ـ فێر؛ ڕاهاتوو ‹دەستەمۆ› ≚ ـ آموز

**مۆ[4]**: پێرۆ. ← مڵومۆ

**مۆبایل** / mobayl/: ☜ گوشی ـ٢

**مۆبەت** / mobet/: ☜ مۆڤەت

**مۆت** / mot/: ☜ مۆتی

**مۆتاز** / motaz/: ئاوەڵناو. ئاتاج؛ چاولەدەس ≚ مُحتاج

**مۆتک** / motik/: ناو. ڕاوکە؛ مارکە ≚ فال

**مۆتۆڕ** / motoř/: ☜ موتور

**مۆتە** / mote/: ناو. ١. ☜ مۆتەکە ٢. پووکاولە ≚ ١. ☜ مۆتەکە ٢. ام

**مۆتەکە** / moteke/: ناو. مۆتە؛ شەوە؛ دیمەن یان بوونەوەری بەهەیبەت و خۆفناک کە بە هۆی ترسی زۆر یان نەخۆشییەوە دێتە بەرچاو ≚ کابوس

**مۆتی** / motî/: ناو. مۆت؛ مووتی؛ دۆشاو؛ دمس؛ شۆک؛ دفس؛ ئاقیت ≚ شیرەی انگور

**مۆجزات** / moc(i)zat/: ☜ مۆجزە[1]

**مۆجزە[1]** / moc(i)ze/: ناو. مۆجزات: ١. کاری زۆر سەیر و سەمەرە کە لە پێغەمبەرانەوە بینراوە و نیشاندەری دەست ڕۆشتوویی هێزی ئاسمانی لە ژیانی مرۆڤە ٢. دیاردە، شت یان کارێکی زۆر سەیر و نائاسایی ≚ ١و٢. مُعجزە

**مۆجزە[2]**: ئاوەڵناو. بلیمەت و زۆر زیرەک ≚ نابغە

**مۆجگاری** / mocgarî/: ☜ مۆجیاری

**مۆجلا** / mocla/: ☜ مێروولە

**مۆجلە** / mocle/: ☜ مێروولە

**مۆجیاری** / mocyarî/: ناو. مۆجگاری؛ ئامۆژگاری ≚ اندرز

**مۆچ[1]** / moç/: ناو. ١. ماچ؛ ماچە؛ ڕامووس ٢. ئامۆژگاری ٣. ڕەگی بەرزی پشتی دەست ≚ ١. بوسە ٢. اندرز ٣. رگ‌های نمایان پشت دست

▣ **مۆچ کردن**: ماچ کردن؛ ڕامووسان ≚ بوسیدن

**مۆچ[2]**: ئاوەڵناو. مووچ: ١. قیت؛ قوت ٢. مۆن؛ ڕووگرژ ≚ ١. برجستە ٢. اخمو

▣ **مۆچ کردن**: گوێشۆڕ کردنی یەکسم ‹ئەم ئێسترە بۆچی مۆچی کردووە؟› ≚ گوش فروهشتن ستور

**مۆچ[3]**: پێرۆ. ← مرومۆچ

**مۆچانن** / moçanin/: چاوگ. ئامۆژگاری کردن ≚ اندرز دادن

**مۆچک** / moçik/: ناو. کەپوولە؛ پێوانەی چکۆلەی دارین ≚ پیمانەی کوچک چوبین

**مۆچکە** / moçke/: ☜ مۆژیار

**مۆچنای** / moçnay/: چاوگ. فێر کردن؛ ڕاهێنان ≚ یاد دادن

**مۆچە** / moçe/: ناو. لەوەڕێکە لە ئەسپەناخ دەکا ≚ علفی شبیه اسفناج

**مۆچی** / moçî/: ناو. مۆڕی؛ ڕووگرژی ≚ اخم

**مۆچیار** / moçyar/: ☜ مۆژیار

**مۆچیاری** / moçyarî/: ☜ مۆژگاری

**مۆچیاری‌کەر** / moçyarîker/: ناو. واعیز؛ ئامۆژیار؛ ئامۆژگاری‌دەر ≚ واعظ

**مۆچیای / moçyay/**: چاوگ. فێر بوون؛ ڕاهاتن 🇮🇷 یاد گرفتن

**مۆخ / mox/**: ناو. مۆخە؛ مووخە: ١. مـژی؛ ئـەوی دە کاسەی سەردایە ٢. مژی ناو ئێسکی ئەندام 🇮🇷 ١. مغز ٢. مغز استخوان

▣ **مۆخ کێشان**: ☜ **مووخە چنین**

**مۆخل / moxil/**: ناو. ١. ☜ **مۆخڵ** ٢. مەفسک؛ کەوگیر 🇮🇷 ١. ☜ **مۆخڵ** ٢. کفگیر

**مۆخڵ / moxił/**: ناو. مخل؛ مخەل؛ مۆخل؛ مووخل؛ ئاردبێژ؛ هێڵەک؛ هێڵەگ؛ بێژنگی زۆر کون‌تەنگ کە ئاردی پێ دادەبێژن 🇮🇷 الک

**مۆخە / moxe/**: ☜ **مۆخ**

**مۆد / mod/**: ناو. داب؛ باو: ١. داکەفتی؛ سەلیقەی کۆمەڵگا ‹ماوەیەک ڕۆیشتن بۆ ئەورووپا مۆد بوو› ٢. نیڤار؛ شت‌ومەکی بەرامبەر بە دابی ڕۆژ و بەبرەو ‹ئێستا ئەم جانتایە مۆدە› 🇮🇷 ١و٢. مُد

**مۆدنە / mod(i)ne/**: ناو. دەمنە؛ مۆمەقەند؛ باسک؛ دارجگەرە 🇮🇷 چوب سیگاری

**مۆدۆلی / modolî/**: ناو. جۆرێک چەکی قەدیمی 🇮🇷 نوعی تفنگ قدیمی

**مۆدە / mode/**: ناو. ١. ژنێ کە بەرگی فەرەنگی دەبەر دەکا ٢. شاکاشی؛ کاسەی گەورەی چینی 🇮🇷 ١. زن آلامُد ٢. کاسەی بزرگ چینی

**مۆر**[1] **/ mor/**: ناو. ١. موهر؛ واژۆ؛ ناو، نەخش، یان نووسراوەی لە سەر کانزا یان پلاستیک کەندراو بۆ شوێن لە سەر کاغەز دانان ‹داغی سینە و پێچ و تابی دوودی ئاهم خۆ هەیە/ مۆر و توڕرەی ئیمپەراتۆر و قەڕالم بۆچییە؟ «مەحوی»› ٢. ڕەنگی بنەوش ٣. ☜ **مۆرانە** ٤. مێرووڵە؛ مرۆچە ٥. خۆڵەکەوە؛ بووڵ ٦. مار ٧. تەرح و دیدار 🇮🇷 ١. مُهر ٢. بنفش ٣. ☜ **مۆرانە** ۴. مورچە ۵. خاکستر ۶. مار ۷. شکل؛ شمایل

▣ **مۆر کردن**: ئیمزا کردن بە مۆر 🇮🇷 مُهر کردن

**مۆر نان**: شەقڵ کردن؛ دیاری کردن 🇮🇷 علامت گذاشتن

**مۆر بە دەرگای کارێکەوە نان**: دەس لە کارێکی ناتەواو بەردان و تازە نەچوونەوە سەری ‹بەوپەڕی ناهومێدییەوە چووم لە وشتەپە کتێب و سیپالەکەم هێنایەوە و مۆرم بە دەرگای خوێندن و فەقێیەتییەوە نا «هەژار، چێشتی مجێور»› 🇮🇷 کاری ناتمام را برای همیشه تعطیل کردن

**مۆر**[2]: ئاوەڵناو. ١. بە ڕەنگی بنەوش ‹کراسی مۆر و سوخمەی زەرد/ کەوای ئاڵ، ڕوومەتی بێ گەرد «قانع»› ٢. دەس‌لێ‌نەدراو؛ کارپێ‌نەکراو 🇮🇷 ١. بنفش ٢. بکر و دست نخورده

**مۆر**[3]: پێرۆ. ← **مەڵ‌ومۆر**

**مۆران / moran/**: ناو. ١. تەم و مژ ٢. دووکەڵ؛ کادو ٣. ☜ **مۆرانە** 🇮🇷 ١. مە ٢. دود ٣. ☜ **مۆرانە**

**مۆرانە / morane/**: ناو. مخورکە؛ مۆڕ؛ مۆران؛ مۆریانە؛ گەزووز؛ مۆریە؛ مۆرکە؛ مۆرەکە؛ مەریکانە؛ مرک؛ مروو؛ مۆرەقە؛ نیوەند؛ خۆرکە؛ خۆرە؛ لێوەنگ؛ سووڕک؛ سوورک؛ مێروویەکی کۆمەڵژی، ئافەتی چێو 🇮🇷 موریانە

**مۆرتک / mortik/**: ناو. ١. دەوەنێکی بۆنخۆشە ٢. پیاوعاقڵی ئاوایی 🇮🇷 ١. درختچەی مورد ٢. دانای روستا

**مۆرجلا / morc(i)la/**: ☜ **مێروولە**

**مۆرجەلا / morcela/**: ☜ **مێروولە**

**مۆرخانە / morxane/**: ناو. قاشە ئەنگوستیلە 🇮🇷 نگین

**مۆرخوانە / morx(i)wane/**: ناو. بەردەئەموستیلە؛ نقیم 🇮🇷 نگین انگشتر

**مۆرخە / morxe/**: ☜ **مۆرەغە**

**مۆرد / mord/**: ناو. ١. مۆرتک ٢. مۆرکە؛ جانەوەرێکە پەشم دەخوا 🇮🇷 ١. درختچەی آس ٢. حشرەی بید

**مۆرد** / morid/: ناو. مەورەت؛ بڕبەند 🇮🇷 سوهان

**مۆردار** / mordar/: ناو. جێ متمانەی پاشا و خان 🇮🇷 مُهردار پادشاه و خان

**مۆردانە** / mordane/: ناو. جێگەی مۆرد 🇮🇷 رویشگاه درختچەی آس

**مۆردەم** / mordem/: ناو. ١. مرۆ؛ مرۆڤ ٢. پیاو؛ نێری بنیادەم 🇮🇷 ١. مردم ٢. مَرد

**مۆردەمەنی** / mordemenî/: ناو. ١. خزمایەتی؛ خوێشی ٢. مرۆڤایەتی؛ جوامێری 🇮🇷 ١. خویشاوندی ٢. جوانمردی

**مۆردن** / morden/: ☜ مردن

**مۆردنە** / mordene/: چاوگ. ١. مردن ٢. هەژماردن؛ حەساو کردن 🇮🇷 ١. مُردن ٢. شمُردن

**مۆرزەلا** / morzela/: ☜ مێرووله

**مۆرک** / mork/: ناو. ١. جۆرێ ترێ ٢. نیشانی تایبەت ‹مۆرکی حیزبایەتی؛ مۆرکی کوردی› 🇮🇷 ١. نوعی انگور ٢. برچسب

**مۆرکری** / mork(i)rî/: ناوەلناو. سەربەمۆر و دەس‌لێ‌نەدراو 🇮🇷 لاک و مُهر شده و دست نخورده

**مۆرکە** / morke/: ناو. مۆرانەی خوریخۆر 🇮🇷 حشرەی بید

**مۆرکەن** / morken/: ☜ مۆرهەڵکەن

**مۆرمان** / morman/: ناو. ژیلەمۆ؛ زیلەمۆ 🇮🇷 خاکستر گرم

**مۆرووچلێ** / morûçłê/: ☜ مریچلێ

**مۆرە** / more/: ناو. ١. موورگ؛ مووروو؛ میەرە؛ میەرگ؛ کرک؛ لەتە خڕیلانەی لە بەرد، چێو، شیشە یان کانزا ٢. لەتەی وا بۆ ناو کایە ‹مۆرەی شەترەنج› ٣. ☜ مۆرەغە ٤. هاوەڵی پێچ کە لەتەیەکی تەخت و کونی ناو شەقارە ٥. چینەی دیواری قوڕ ٦. لەتی بە مشار بڕدراو لە کۆلکەدار ٧. لۆرە؛ گۆرانی بە سۆزە ٨. باو؛ ڕمێن 🇮🇷 ١. مُهره ٢. مُهرەی بازی ٣. ☜ مۆرەغە ٤. مُهرەی پیچ ٥. چین دیوار گلی ۶. قطعه کُندەی بریده با ارّه ٧. زمزمه؛ ترنُم ٨. رواج

▣ **مۆرە بە سەر چوون**: لە برەو کەوتن 🇮🇷 از رواج افتادن

**مۆرە هەڵاویشتن**: مۆرە هەڵخستن ‹کوشتمی و شەش‌خانی ئوممێدی لە من گرتن حەریف/ مۆرە هەڵداوێم و بێهوودە بە هیوای دووشەشم «هێمن»› 🇮🇷 تاس انداختن

**مۆرە هەڵخستن**: ☜ مۆرە هەڵاویشتن

**مۆرەت** / moret/: ناو. بڕبەند؛ مرمەند؛ مەوورەت 🇮🇷 سوهان

**مۆرەخە** / morexe/: ☜ مۆرەغە

**مۆرەسەنگ** / moreseng/: ناو. مووروولەی ئاش 🇮🇷 مُهرەی قطب آسیا

**مۆرەغە** / moreğe/: ناو. مرۆغە؛ مۆغەرە؛ مووروەغە؛ مۆرخە؛ مۆرتخە؛ مورتخە؛ مورەتخە؛ مورەغە؛ مۆرەخە؛ مرۆخە؛ مۆرە؛ مووروەگە؛ مووریّ؛ بڕبڕە؛ بڕگە؛ بڕبڕاگە؛ بڕبڕاگێ؛ مازگە؛ مازە؛ گازەرا؛ گەوبەند؛ گەوبەندە؛ مازیّ؛ مەژگورە؛ کرک؛ ماری پشت؛ موفکا پشت؛ کرک‌مازێ؛ کرک‌پشت؛ گاڕگارە؛ سنسل؛ تەرختە؛ تێغەرە؛ ناڤدەرگ؛ دۆڕپشت؛ ڕزنەئێسک و کرۆژەی پێکهێنەری بڕبڕاگەی پشت 🇮🇷 ستون فقرات

**مۆرەقە** / moreqe/: ناو. مۆرەکە؛ مۆرانەی لاسکی دەخڵ و دار خۆر 🇮🇷 موریانەی ساقه و درخت

**مۆرەکە** / moreke/: ناو. ١. ☜ مۆرەقە ٢. ☜ مووروەکەرانە

**مۆرەمۆر** / moremor/: ناو. لۆرەلۆر 🇮🇷 زمزمه؛ ترنُم

**مۆرهەڵقەن** / morhełqen/: ناو. حەکاک؛ کەندەکار؛ کەندۆخ 🇮🇷 حکاک

**مۆرهەڵکەن** / morhełken/: ناو. مۆرکەن؛ کەسێ کە ناو لە کانزا هەڵدەکەنێ 🇮🇷 حکّاک

**مۆری** / morî/: ناو. ١. مسقاڵێ لە زەنگیانە ٢. ☜ **مێروولە** ٣. مووروو؛ مـوورگ ٤. خـامی سـپی کـە دەکرێتە کراسی پیاوانە ☰ ١. یک مثقال منجوق ٢. ☜ **مێروولە** ٣. مُهرە؛ مُهرەی زینتی ۴. چلوار

**مۆریانە** / moryane/: ☜ **مۆرانە**

**مۆریژان** / morîjan/: ناو. مۆریژانک؛ گیایەکـە مـار توخنی ناکەوێ ☰ گیاهی که مار از آن می‌گریزد

**مۆریژانک** / morîjanik/: ☜ **مۆریژان**

**مۆریلە** / morîle/: ☜ **مێروولە**

**مۆریە** / morye/: ☜ **مۆرانە**

**مۆڕ**[1] / moř/: ناو. مڕ؛ کاری بە چـاوی زەق ڕوانـین ☰ نگاه خیره

⊡ **مۆڕ بردنەوە:** ☜ **مۆڕ بونەوە**

**مۆڕ بونەوە:** مۆڕ بردنەوە؛ بە تووڕەییـەوە تماشـا کردن ☰ چشم‌غُرّه رفتن

**مۆڕ**[2] / moř/: ☜ **مڕومۆچ**

**مۆڕە** / moře/: ناو. کاری ڕوانین بـە چـاوی زەق و بە تووڕەیی ☰ عمل خیره و خشمناک نگریستن

**مۆڕی** / mořî/: ناو. ١. مـۆچی؛ ڕووگـرژی ٢. زەق؛ کاری بە زەقەوە ڕوانین ☰ ١. اخـم ٢. عمـل خیـره نگریستن

**مۆز** / moz/: ناو. ١. مێشک؛ مێرووییەکە لە تـیرەی زەنگەسووره و درشت‌تر، زەرد و سەوزی هەیە ٢. مەوز؛ مۆزی؛ دار یـان دەوەنی گەرمەسـێری بـە میوەی خۆراکیی درێژ و باریک و گۆشتن و تـۆی لە ماکی قەندییەوە ٣. گوڵێکی بالا بڵندی ڕەنگ ئاڵـە، گـەڵای زۆر پانـە ٤. مێشـک؛ باڵـدارێکی بچووکە پێشکە دەخوا ٥. *[ناشـیرین]* کـار و ڕەوتی دەورە دانی ژن ☰ ١. مژمژ؛ نوعی زنبـور درشـت ٢. موز ٣. گُل اختر ۴. پرندەای کوچک پشەخوار ۵. لاس

⊡ **مۆز کردن:** مۆز کرن؛ مۆز گرتن؛ ڕاکردنی گـا و گۆل لە ژان و ترسی زیاتر پێوەدانی مـۆز ☰ رم کردن گاو از مژمژ

**مۆز کرن:** ☜ **مۆز کردن**

**مۆز گرتن:** ☜ **مۆز کردن**

**مۆزرگان** / mozirgan/: ☜ **مۆڵگە ـ١**

**مۆزرگانـە** / mozirgane/: نـاو. مۆڵـگە؛ مـۆزەلان؛ مەخەل؛ جێگەی مۆڵ خواردن ☰ جای استراحت گلّه بعد از چرا

**مۆزریک** / mozrîk/: ناو. ئاورینگ؛ پریشکی ئاگر ☰ جرقه

**مۆزک** / mozik/: ☜ **مێشەکەرانە**

**مـۆزگرە** / mozg(i)re/: نـاو. مێشـگرە؛ جۆرێـک زەڵـەقوونی بـۆر و کلـک کـوڵ و تیژڕۆیـە مـۆز دەگرێت ☰ نوعی سنجاقک

**مۆز مۆز** / mozmoz /: نـاو. کـار و ڕەوتی گـەڕان و سووڕان بە دەوری شتێکدا، وێڕای تەماح‌تێ‌کردن ‹هەر لە دەوری ئەو ژنە مۆزمۆزیەتی!› ☰ عمل طمع در چیزی کردن

**مۆزەبـەش** / mozebeş/: نـاو. جـۆرێ قالۆنچـەی سوورە ☰ نوعی ساس

**مۆزەڕەشە** / mozeřeşe/: ناو. کـۆراخ؛ مێروویـەکی ڕەشە لە زەرگەتـە زلتـر ☰ حشـرەای سـیاه رنـگ بزرگتر از زنبور

**مۆزەشینە** / mozeşîne/: ☜ **مێشەکەرانە**

**مـۆزەکـەرانـە** / mozekerane/: نـاو. کـۆرۆخ؛ خەرەنگەزە؛ کەرەنگێزە ☰ خرمگس

**مۆزەلان** / mozelan/: ☜ **مۆڵگە ـ١**

**مۆزەمۆز** / mozemoz/: ناو. کـار و ڕەوتی بـە دەورا هاتن بە تەمایەک ‹ئەوە مۆزەمۆز بە تەمای چیت؟› ☰ موس‌موس

⊡ **مۆزەمۆز بون:** *[ناشیرین]* بە دەوری شتێکدا هـاتن و تەمایـەکی زۆرتـر نـاڕەوا لـە دڵـدا بـوون ‹ماوەیەکە لە دەوری ئەو ژنـە مۆزەمۆزیـەتی!› ☰ موس‌موس کردن

**مۆزی** / mozî/: ناو. *[شـوورەیی]* مۆزیک؛ کونی کێـر؛

شوێنی هاتنه دەری گمێز 🇮🇷 إحلیل؛ سوراخ ذکَر

**مۆزیقا** / mozîqa/: ناو. مۆزیقە؛ بۆرییە؛ توتوک؛ کەڕەنا؛ بۆری؛ شەیپوور؛ سازێکی بایی کانزایی، بە شێوەی لوولەیەکی درێژ و چەماوە کە سەرەکەی هەراوە و هێندێک کلیل و دوگمەی لە سەرە 🇮🇷 شیپور

**مۆزیقە** / mozîqe/: ☜ مۆزیقا

**مۆزیقەچی** / mozîqeçî/: ناو. بۆریژەن 🇮🇷 شیپورنواز

**مۆزیک** / mozîk/: ناو. ١. پارگوێل؛ پارێن ٢. کۆڵەبەس؛ کۆڵەوەس؛ زارۆی ژن لە مێردی تر ٣. ☜ مۆزی ٤. ☜ مووسیقا 🇮🇷 ١. گوسالەی دوساله ٢. بچەی زن از شوهر قبلی ٣. ☜ مۆزی ۴. ☜ مووسیقا

**مۆژ**[١] / moj/: ناو. گوڵاوی پچووک 🇮🇷 برکەی کوچک

**مۆژ**[٢]: ئاوەڵناو. لووتپان 🇮🇷 پهن‌بینی

**مۆژگاری** / mojgarî/: ناو. مۆچیاری؛ ئامۆژگاری 🇮🇷 اندرزگویی

**مۆژلا** / mojla/: ☜ مێروولە

**مۆژلە** / mojle/: ☜ مێروولە

**مۆژلەیکوتان** / mojleykutan/: ناو. مێرووی درشت؛ میرووە عەجەمانە 🇮🇷 مورچەی درشت

**مۆژنایش** / mojnayîş/: چاوگ. نیشاندان؛ لە بەر چاو ڕانان 🇮🇷 نمودن؛ نشان دادن

**مۆژە** / moje/: ناو. پەژارە؛ خەم؛ خەفەت 🇮🇷 اندوه

**مۆژیار** / mojyar/: ناو. مۆچکە؛ مۆچیار؛ ئامۆژگار 🇮🇷 اندرزگو

**مۆست** / most/: ☜ ماست

**مۆسترە** / most(i)re/: ئاوەڵناو. سۆسرەت؛ سەمەرە؛ سەیر 🇮🇷 عجیب

**مۆستک** / mostik/: ناو. مەمکەمژ؛ مەمکەی دەسکردی زارۆ خەڵەتێن 🇮🇷 پستانک بچه

**مۆسقۆف** / mosqof/: ناو. نەژادی ڕووس 🇮🇷 نژاد روس

**مۆسک** / mosk/: ناو. گیایەکی بالابەرزی قەفقەفە مناڵ فیچقەی لێ ساز دەکەن 🇮🇷 گیاهی است

**مۆسلا** / mosla/: ناو. باسکێش؛ درێژترین دار لە هەوجاڕدا 🇮🇷 بلندترین چوب در خیش

**مۆسە** / mose/: ☜ ماسی[١]ـ١

**مۆسیقا** / mosîqa/: ☜ مووسیقا

**مۆسیقار** / mosîqar/: ☜ مووسیقار

**مۆش** / moş/: ئاوەڵناو. بێنرخ؛ بێبایەخ 🇮🇷 بی‌ارزش

**مۆشەن** / moşen/: ناو. موشان؛ موشانە؛ جەنجەڕ؛ ئامراز یان ماشینی کوتان و جیا کردنەوەی کا و کلۆش لە دان 🇮🇷 خرمنکوب

**مۆغەرە** / moğere/: ☜ مۆرەغە

**مۆفکە** / mofke/: ناو. چڵم 🇮🇷 خُلم

**مۆڤر** / movir/: ئاوەڵناو. هێدی؛ ئارام 🇮🇷 آرام

**مۆڤک** / movik/: ناو. ١. ئێسکەوردەی ناو لەش ٢. بەند و گەی لەش ٣. گرێ ناو ساقەتەی ڕووەک ٤. دارۆکەی پشکی مەشکە 🇮🇷 ١. استخوان‌های ریز بدن ٢. بند استخوان ٣. بند ساقەی نباتات ۴. چوبک سوراخگیر مشک

▣ **مۆڤکا پشت** ☜ مۆرەغە

**مۆڤکا مل**: بەند و گەی شان و پیل 🇮🇷 بند استخوان شانه

**مۆڤەت** / movet/: ناو. محەببەت؛ موحببەت؛ مۆبەت؛ مەوبەت؛ مهەبەت: ١. ڤیان؛ عیشق؛ ئەوین؛ مێر ٢. خۆشەویستی؛ خوەشەویسی؛ وەشەویسی؛ دلۆڤانی؛ سۆزداری؛ میهرەوانی 🇮🇷 ١و٢. محبت

**مۆقنای** / moqnay/: چاوگ. لە کەسێ تووڕە بوون و دەنگ لێ هەڵبڕین 🇮🇷 از کسی عصبانی شدن و بر سرش داد زدن

**مۆکڵ** / mokił/: ناو. *[باوەڕی کۆن]* ئاڵ؛ هاڵە؛ جنۆکەی زەیستانکوژ 🇮🇷 آل زائو

**مۆل / mol/**: ناوەلناو. دوڕە؛ بـاوک تـاژی دایـک سەگ ☰ دورگە (سگ)

**مۆلاقە / molaqe/**: ناو. مۆلەقە؛ ئەسپابێکی جۆلایە ☰ از ابزارهای بافندگی

**مۆلک / molik/**: ناو. کرمی هەرەدرێژی ناو زگ ☰ کرم کدو

**مۆللا / molla/**: ☜ مەلا

**مۆلە / mole/**: نـاو. سنگی دارین؛ گولمیخی لە دار ☰ میخ کلفت چوبین

**مۆلـەق / moleq/**: ناوەلـناو. مەولـەق: ١. ئـاویزان؛ هەلواســـراو؛ دالـــەقاو ٢. دەرپـــەڕیوی زەق و بێ‌جوولە (چاو) ‹چاوی مۆلەق بوو› ☰ ١. مُعلـق ٢. برآمدەی بی‌حرکت (چشم)

⊡ **مۆلـەق بـوون** وێـستان بـەبێ بـزووتن ☰ بـدون حرکت ایستادن

**مۆلەقە / moleqe/**: ☜ مۆلاقە

**مۆلەکە / moleke/**: ناو. جێگەی ترس و مـردن ☰ مهلکه

**مۆلەیەی / moleyey/**: ☜ مەلایەتی

**مۆڵ١ / mol/**: نـاو. ١. مۆلـە؛ جێگـەی پشـوودانی گاڕان لە چێشتەنگاودا ٢. مۆلە؛ چۆنیـەتی لێـک کۆ بوونەوەی گا و گـۆل لـە شـوێنێک ٣. کۆگـا؛ شوێنی کۆ بوونەوە ٤. فرۆشگای زۆر گەورەی لـە چەند قاتدا ‹فامیلی مۆل› ☰ ١. شبغاز گلەی گاوهـا ٢. تجمع احشام ٣. محل تجمُع ۴. فروشگاه بزرگ

⊡ **مۆڵ بـوون** مۆلـین؛ مـۆڵ خـواردن؛ مـۆڵ دان؛ نووستنی گا و گۆل و ئاژەلان لە شوێنێ نزیـک بە یەکتر ☰ تجمع و آسودن احشام در کنار هم

**مۆڵ خواردن** ☜ مۆڵ بوون

**مۆڵ دان** ١. نوانـدن و پشـوودان بـە ئـاژەل و بەگشتی، هەموو چوارپەلی دەستەمۆ ‹کە مۆلم دا مێگەلی تێر لە سەر سەوزە گیا!/ زەردەی هەتاو ئەگرێتە زێـر ڕووی دەشـت و چیـا «گـۆران»› ٢. ☜ **مۆڵ بوون** ☰ ١. استراحت دادن به اَحشـام در یک جا ٢. ☜ **مۆڵ بوون**

**مۆڵ٢**: ناوەلناو. زۆر؛ زەحف؛ فرە ☰ زیاد

**مۆلگە / molge/**: ناو. مۆل: ١. مۆزرگانە؛ مۆزرگان؛ مۆزەلان؛ مەخەل؛ جێگەی مۆڵ خواردن ‹فیتـەی شـوان، ئۆحـەی گـاوان/ دێ لـە مۆلـگە و دەراوان «هێمن»› ٢. *[پلار]* شوێنی حەسانەوە و نیشتەجێ بوونی قوشوون ☰ ١. جای آسایش گلە بعد از چرا ٢. اردوگاه؛ استراحتگاه نظامی

**مۆلە / mole/**: ناو. ١. قوڕی خۆشە بوو بۆ سواغ ٢. ☜ **مۆڵ١ـ١و٢** ☰ ١. گِـل آمـادە انـدودن ٢. ☜ **مۆڵ١ـ١و٢**

⊡ **مۆلە کردن** سواخ دان ☰ گِل اندودن کردن

**مۆلەت / molet/**: ناو. قان؛ قانە؛ ماوە ☰ مُهلت

⊡ **مۆلەت دان** دەرفەت دان ☰ فُرصت دادن

**مۆلـەت (لێ)خواستن** دەرفـەت داوا کـردن ☰ فُرصت خواستن

**مۆلەقێ / moleqê/**: ناوەلـکار. زۆرێـک؛ هەنـدێکی زۆر ‹مۆلەقێ گوێزمان شارۆ دا› ☰ مقدار زیادی

**مۆلـەگار / molegar/**: نـاو. شـوێنی حەسـانەوەی گاگەل ☰ استراحتگاه احشام

**مۆلین / molîn/**: ☜ **مۆڵ بوون**

**مۆم / mom/**: نـاو. مووم: ١. شەم؛ شەمێ ٢. مێـو؛ کـراش؛ کراشـە؛ کـرێش؛ کـراژ؛ کـراژ؛ بـەرمیت؛ ماکێکی نەرمی مەیلەو زەردە لە ئاودا ناتوێتەوە لە کان، گیا و گیانەوەر و بەتایبـەت لـە تواندنـەوە و پالافتنی شانەی هەنگوێن بەرهەم دێ ☰ ١. شمع ٢. موم

**مۆمدان / momdan/**: ناو. شەمدان ☰ شمعدان

**مۆمک / momik/**: نـاو. شـەمی پچـووک ☰ شـمع کوچک

**مۆمکەر / momker/**: ناو. شەمچێ‌کەر ☰ شمع‌ساز

**مۆمنا / momna/**: ☜ مۆمیا

**مۆمناو** / momnaw/: ☜ **مۆمنایی ـ٢**

**مۆمنـای** / momnay/: چـاوگ. هێورانـــدن ☰ آرام کردن

**مۆمنـایی** / momnayî/: نـاو. ١. ☜ **مۆمیـــایی** ٢. مۆمناو؛ مۆمینە؛ مشەمما؛ چنـراوێ ئەسـتوور بـە سـواخی لاسـتیک، پلاسـتیک، جـەوی یـان ترەبانتین، کـە وەک ڕاخـەرێک بـەکار دێ ☰ ١. ☜ **مۆمیایی** ٢. مُشمع

**مۆمەقەنـد** / momeqend/: نـاو. باسـک؛ مۆدنـە؛ دارسیغار ‹ئەگـەرچی مۆمەقەنـدت کارەبایـە/ بـەلام تەرکی بکە ئەم کارە، بابە! «؟»› ☰ چوبسیگار

**مۆمی** / momî/: ناو. شەم؛ شەماڵک ☰ شمع

**مۆمیا** / momya/: ناو. مۆمنا؛ ماکێکی قاوەیی تـۆخ و دەڵەمە کە لە زەوینی نەوتداردا بەدی دێ و لە کۆنـدا بـە ڕۆن دەیانگرتـەوە و هەویرەکـەیان بـۆ دەرمانی برین و شکستە و ڕاگرتنی لەشی مردوو بە کار دێنا ☰ مومیا

**مۆمیای** / momyay/: چاوگ. هێور بوونـەوە ☰ آرام شدن

**مۆمیـایی** / momyayî/: نـاو. مۆمنـایی؛ میمنـایی؛ کـەلاکی مۆمیـاکراو بـە مەبەسـتی بـەرگری لـە داڕزانی ☰ مومیایی

**مۆمینە** / momîne/: ☜ **مۆمنایی ـ٢**

**مۆن**[١] / mon/: ناو. مێ؛ مێوینە ‹مۆن گا› ☰ مادینه

**مۆن**[٢]: ☜ **مڕومۆچ**

▪ **مۆن**[٣]: پاشەوشە. ـ هۆن؛ هۆنەر؛ ڕێسکار ☰ ـ تاب

**مۆنج** / monc/: ناو. ١. بریقەی پەڵەپەڵە لـە کـردا ٢. ڕەوتی گەڕانەوەی بەتەوژمی ئـاوی ڕاوەسـتاو ‹شەپۆلی دەریای بێسنوور، لە داوێنی بەستێنا مردا!/ مۆنجی پەژارە، پەرۆشی قەلای پڕ هیـوای دڵـی بـرد «سوارە»› ☰ ١. امواج برّاق در بافت ٢. برگشت آب راکد با فشار

⊡ **مۆنج داگرتن**: تۆران؛ زیز بوون ☰ قهر کردن

**مۆنگا** / monga/: ☜ **مانگا**

**مۆنە** / mone/: ناو. ١. ئاکـار؛ ڕەوش ٢. چۆنیـەتی واز لێ نەبوون؛ بە قەڵسی ڕوانـین ٣. ناوەڕاسـت؛ ناوەند؛ چەق ☰ ١. روش؛ منش ٢. بیزاری ٣. مرکز

⊡ **مۆنە لێ کردن**: بێز لە شتێ هاتنـەوە و ڕوو لـێ هەڵچەرخاندنەوە ‹خۆشی ناوێ، مۆنەی لێ دەکا›
☰ اظهار بیزاری کردن و رو گرداندن

**مۆنەی** / money/: ناو. بەهانە؛ پەڵپ ☰ بهانه

**مۆنـەیـی** / moneyî/: نـاو. ناوەنـدێتی؛ دۆخ یـان چۆناوچۆنی ناوەند بوون ☰ مرکزیّت

**مۆنی** / monî/: ناو. ڕووگرژی؛ مڕومۆچی ☰ بداخمی

**مۆو** / mow/: نـاو. مێـو؛ ڕەز؛ داری تـرێ ☰ تـاک؛ درخت انگور

**مۆوژ** / mowij/: ☜ **مێوژ**

**مـو** / mû/: نـاو. ١. موویـە؛ مـی؛ تاڵـی ناسـک و پتەوی سەر و لەشی زۆربەی گوانداران بەتایبـەت مرۆ ٢. نەخۆشییەکە لە قامک دێت و زۆر بەئێشە ٣. کولکەی زروی جۆرێ بزن ٤. نـووکی دەرزی ٥. سەر لێوی تیژی تیخ ٦. کوڵ و خـەم ٧. ☜ موە ـ١ ☰ ١. مو ٢. کژدُمە ٣. پشم زبر نـوعی بـز ۴. نوک سوزن ۵. لبەی تیز تیـغ ۶. غـم؛ انـدوه ٧. ☜ موە ـ١

⊡ **مـوی بـەر/ وەن**:*[شـوورەیی]* تووکەبـەر؛ مـووی بەرگەدە ☰ موی زهار

**موی لووت**:*[کینایە]* دەردیسەر؛ موزاحیم ☰ مـوی دماغ

⊡ **مو بە بەینیدا نەچوون**:*[کینایە]* زۆر دۆست بـوون؛ هاوەڵی گیانی-گیـانی بـوون ☰ دوست جـانی بودن

**مو تێنەچوون**:*[کینایە]* بێعەیب و خەوش بـوون ☰ مو لای درز (چیزی) نرفتن

**مو قرژ بوونەوە**:*[کینایە]* کـرژ بوونـەوەی تـووکی لەش بە هۆی تووڕە بوونی یان ترسـانی زۆر ☰

مو به تن کسی سیخ شدن

**موو ڕنین:** /کینایە/ دەربڕینی خەم یان تووڕەیی زۆر ☰ اظهار کردن اندوه یا خشم بسیار

**موو کردن:** ١. زۆر تیژ بوون ٢. پەژیوان بوونەوە لە وەرنەگرتنی شتێ کە پێی بەخشراوە ☰ ١. بسیار تیز بودن ٢. پشیمان شدن از نپذیرفتن بخششی

**موو لە ماست دەرکێشان:** /کینایە/ ماست و موو بژاردن؛ وردبین بوون ☰ مو را از ماست کشیدن

**موو نەپساندن:** /کینایە/ تەواو بەیدەست و فەرمانبەر بوون ‹کەچی ئێستا لە داوی بسکی تۆدا/ گرفتارم گوڵم، موو ناپسێنم «هێمن»› ☰ تسلیم محض بودن

**موو وەرین:** تووک لە لەش وەرین بە هۆی نەخۆشینەوە ☰ ریختن موی بدن بر اثر بیماری

**مووی کەسێک هەڵپرووزاندن:** ☜ **مووی کەسێک هەڵکزاندن**

**مووی کەسێک هەڵکزاندن:** /کینایە/ مووی کەسێک هەڵپرووزاندن؛ لە کوتوپڕا و زۆر بەجێ لە شوێنێکدا پەیدا بوون ☰ موی کسی را آتش زدن

**بە موویەکەوە بەسران:** /کینایە/ بە پفێکەوە بەند بوون؛ لە پچڕان و تێدا چووندا بوون ☰ به مویی بند بودن

**مووئەنگێو** / mû'engêw/: ئاوەڵناو. /کینایە/ زۆر دەستڕاست لە ئەنگووتندا ‹چەن هەزاران تفەنگچی مووئەنگێو/ چەن کوڕی سەفدڕی جیهانی هەیە «قانع»› ☰ بسیار دقیق در نشانەگیری

**مووبڕ** / mûbiř/: ئاوەڵناو. زۆر کپ؛ توند بە سەر یەکا دراو ‹پێوەی دە! مووبڕی کە!› ☰ کیپ؛ بدون منفذ

**مووبەق** / mûbeq/: ناو. مدبەق؛ مدوەق؛ جێگەی چێشت لێنان ☰ مطبخ؛ آشپزخانە

**موویەموو** / mûbemû/: ئاوەڵکار. سەرلەبەر: ١. بە وردی (لەمەڕ خەبەر و باسەوە) ‹وەکوو ئاواڵی چاک ئەستێرەکان گوێ ڕادەدێرن بۆم/ هەتا بۆیان بەیان کەم مووبەموو ڕازی دەروونی خۆم «هێمن»› ٢. هەموو؛ تێکڕا ‹هەتا تۆم ئاشنا بووی، ئاشنام بوون/ ئەمێستا مووبەمووم ئەغیارە بێ‌تۆ «نالی»› ☰ ١. موبەمو ٢. همە؛ بە کلی

**مووتاب** / mûtab/: ناو. مووتاو؛ کەسێ کە جەواڵی لە موو دروس ئەکا ☰ موتابچی

**مووتاو** / mûtaw/: ناو. ١. ☜ **مووتاب** ٢. تاڵەموو؛ تاڵەبەنی موو ☰ ١. ☜ **مووتاب** ٢. تار مو

**مووتک** / mûtik/: ناو. مۆرد؛ مۆرتک؛ دەوەنێکی بۆنخۆشە ☰ درختچەی آس

**مووتە** / mûte/: ناو. مەلێکی پۆپەداری زۆر دەنگخۆشە ☰ پرندەای کاکُلی و خوش آواز

**مووتی** / mûtî/: ☜ **مۆتی**

**مووچ**[1] / mûç/: ناو. ١. جومگەی دەست ٢. ڕەوتی چەمین؛ چەقین ☰ ١. مُچ ٢. خم

**مووچ**[2]: ئاوەڵناو. ١. ☜ **مرومۆچ** ٢. قوت؛ قیت؛ مۆچ (بۆ گوێ) ‹گوێ مووچ کرن› ☰ ١. ☜ **مرومۆچ** ٢. تیز (گوش)

**مووچ**[3]: پێرۆ. ← **ماچ و مووچ**

**مووچاچ** / mûçaç/: ☜ **مووچاخ**

**مووچاخ** / mûçax/: ناو. مووچاچ؛ پرچی بەدەڵ ☰ کُلاەگیس

**مووچاندن** / mûçandin/: چاوگ. تێپەر. //مووچاندت؛ دەمووچێنی؛ بمووچێنە// مووچانن؛ مووچاندنەوە؛ مووچاننەوە؛ داهێنانەوە؛ لارەو کردن؛ لار کردنەوە ☰ خم کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەمووچاندن

**مووچاندنەوە** / mûçand(i)newe/: ☜ **مووچاندن**

**مووچانن** / mûçanin/: ☜ **مووچاندن**

**مووچاننەوە** / mûçannewe/: ☜ **مووچاندن**

**مووچانە** / mûçane/: ناو. ١. ☜ **مووچە ـ١** ٢.

باجی خاوەن ملک لە ڕەعیەتی جووتبەندە ☰ ١. ☜ موچە ـ١ ٢. بهرەی مالکانە

**مووچانەوە** / mûçanewe/: ☜ **مووچیایوە**

**مووچرک** / mûçirk/: ☜ **مچوڕك**

**مووچڕک** / mûçiřk/: ناو. ١. ☜ **مچوڕك** ٢. مشەمای دەرمان کە بە پێستەوە دەلکێنرێ ☰ ١. ☜ **مچوڕك** ٢. مُشمع

⊡ **مووچڕک بە لەشدا هاتن:** ☜ **مچوڕك بە لەشدا هاتن**

**مووچڕکە** / mûçiřke/: ☜ **مچوڕك**

**مووچک** / mûçik/: ناو. /شووڕەیی/ تووکە بەر ☰ موی زهار

**مووچن** / mûçin/: ناو. مچینک؛ مووچینک؛ مووکەش؛ مووکێش؛ میکە؛ مەقاچ؛ ئامرازی موو هەلکێشان ☰ موچین

**مووچنایوە** / mûçnaywe/: چاوگ. مووچاندنەوە ☰ خم کردن

**مووچە** / mûçe/: ناو. ١. مچە؛ مواجب؛ مووچانە؛ جیرە ‹بۆچی مووچەیان ناکەن ئیزافە/ ئەوانیش تێر بن مەگەر خیلافە؟ «حەقیقی»› ٢. بەش؛ پشک؛ بەربەش ٣. کێلگەی بەشی مالێکی جووتبەندە ‹مووچەکەی ئێمە دوورە› ٤. جومگە؛ بەند؛ مۆفک ٥. نووشتە؛ دوعای نووسراو ٦. دەستەیەک نانی سەر یەک خراو ‹دوو مووچە نانی بە دەستەوە بوو› ☰ ١. حقوق؛ مستمری ٢. سهم ٣. مزرعەی یک خانوادەی کشاورز ۴. مفصل ۵. دعای نوشتەشدە ۶ دستە (نان)

**مووچەخۆر** / mûçexor/: ناو. ١. جیرەخۆر ٢. کارگێر ‹مووچەخۆری دەولەت› ☰ ١. مستمری‌بگیر ٢. کارمند

**مووچەرک** / mûçerik/: ☜ **مچوڕك**

**مووچە ـ مووچە** / mûçe mûçe/: ئاوەلکار. بەشەـ بەشە ☰ بخش ـ بخش

**مووچەوانە** / mûçewane/: ناو. موچەوانە؛ دەسبەندی خشل ☰ دستبند زینتی

**مووچیانەوە** / mûçyanewe/: چاوگ. داهاتنەوە؛ چەمانەوە ☰ خم شدن

**مووچیایوە** / mûçyaywe/: چاوگ. مووچانەوە ☰ خم شدن

**مووچینک** / mûçînik/: ☜ **مووچن**

**مووخڕکە** / mûxiřke/: ☜ **مووخۆرکە**

**مووخل** / mûxil/: ناو. ١. ☜ **مۆخل** ٢. پالوێنە؛ کەوگیر ☰ ١. ☜ **مۆخل** ٢. کفگیر

**مووخۆر** / mûxor/: ناو. داڕوو؛ دەرمان حەمام ☰ واجبی

**مووخۆرکە** / mûxorke/: ناو. مووخڕکە؛ مووخۆرە؛ مووخوەرە؛ خڕکانە؛ نەخۆشینێکی موو بەتایبەت مووی سەر، کە تورت و دوولقان دەبێتەوە و پاشان دەشکێ ☰ موخورە

**مووخۆرە** / mûxore/: ☜ **مووخۆرکە**

**مووخە** / mûxe/: ☜ **مۆخ**

⊡ **مووخە چنین:** /کینایە/ مۆخ کێشان؛ ئەرک و زەحمەت پێ دان و جاڕز کردن ‹بەکرە شۆفارە ئەوی مووخەی چنیم/ زیی مەم و زینان ولاتی لێ تەنیم «هێمن»› ☰ رنج و عذاب دادن

**موود** / mûd/: ناو. ١. شەڕە قسە ٢. ئێرەیی ٣. دژایەتی ☰ ١. جَدَل ٢. حسادت ٣. مُخالفت

**مووداپۆش** / mûdapoş/: ناو. پۆرتک؛ سەرپۆش ☰ سرپوش

**موودار** / mûdar/: ئاوەلناو. ١. تایبەتمەندی چاوێ کە نەخۆشی مووی گرتبێ ٢. کولکن؛ تووکن ☰ ١. چشم بیمار از نوعی درد ٢. پُرمو

**موودنە** / mûd(i)ne/: ناو. مۆدنە؛ دارجگەرە ☰ چوب سیگاری

**موودە** / mûde/: ئاوەلناو. ژێهاتی؛ هەلکەوتە ☰ سرآمد

**موور** / mûr/: ناو. ١. سووچ؛ گۆشە ٢. باڵدار؛ پەلەوەر ٣. گریان؛ شیوەن ٤. /کینایە/ ڕۆژوو؛ ڕۆژگ ٥. مێرووله؛ مرۆچە ‹مار و موور› ٦. شتی چکۆلەی سماو بۆ جوانی و خشڵ ‹ملوێنکی موور› ٧. چرۆچاو ‹مووری خۆ تاڵ کرد› ٨. هێزم؛ بڕەدار ٩. ☜ **موورە ــ١وە** ☰ ١. گوشه ٢. پرنده ٣. مویه ٤. روزه ٥. مورچه ٦. مُهره ٧. رُخسار ٨. قطعەی هیزم ٩. ☜ **موورە ــ١وە**

**موورا** / mûra/: ناو. کووزەکەی شین کە بۆ چاوەزار لە شانی منالی دەدەن ☰ مُهرەی کبود دفع چشم زخم

**موورتک** / mûrtik/: ناو. مۆرتک؛ موورد؛ مورد؛ مووتک؛ میتگ؛ کەییر؛ کەیرە ☰ گیاه مورد

**موورد** / mûrd/: ☜ **موورتك**

**موورک** / mûrik/: ناو. ١. مووری خشڵ ٢. پێشکەی زۆر وردیله ☰ ١. مُهره ٢. پشەی ریز

▣ **موورک لە خۆ نان:** /کینایە/ خۆ بە زل شاندان و شاتوشووت کردن ☰ لاف بی معنی زدن

**موورکومایه** / mûrkumaye/: ناو. ڕێز و حورمەت ☰ سنگینی؛ وقار

**موورگ** / mûrig/: ناو. ١. موور؛ موورک ٢. ☜ مێروله ☰ ١. مُهره ٢. ☜ **مێروله**

**موورگەبا** / mûrgeba/: ☜ **مووروەبا**

**موورگەکەوڵە** / mûrgekewłe/: ☜ **مووروەکەرانه**

**موورگەکەوەڵە** / mûrgekewełe/: ☜ **مووروەکەرانه**

**موورگەگیا** / mûrgeg(i)ya/: ☜ **مووروەگیا**

**مووروەکەرانە** / mûr(i)wekerane/: ☜ **مووروەکەرانه**

**مووروگیا** / mûr(i)weg(i)ya/: ناو. پێچیلە؛ موورگەگیا ☰ گُل لادن

**موورو** / mûrû/: ناو. ١. موورک؛ موور؛ موورگ ٢. ☜ هەرمێ ☰ ١. مُهره ٢. ☜ **هەرمێ**

▣ **مووروی ئاش:** ☜ **مووروەئاش**

▣ **مووروی شین:** ☜ **مووروەشین**

**مووروز** / mûrûz/: ناو. ١. کزی و ماتی ٢. بەدبەختی؛ کلۆلی ☰ ١. اندوه ٢. بدبختی

**مووروله** / mûrûle/: ناو. ١. ☜ **مووروەئاش** ٢. داروکێکە لە نێوان مژانە و ئێرەقەدا ٣. بەرکۆلە؛ بەشێکی ئاموورە ☰ ١. ☜ **مووروەئاش** ٢. ابزاری در خیش ٣. قسمتی از خیش

**مووروەئاش** / mûrûwe'aş/: ناو. مووررووی ئاش؛ موورووله؛ بەردێ خڕە لە بن تەوەرەی ئاسیاودا ☰ مُهرەی قطب آسیا

**مووروەبا** / mûrûweba/: ناو. موورگەبا؛ جۆرێ موورکی سپی کە بە پیرۆز دەزانرێ ☰ نوعی مُهرەی سفید شگون‌دار

**مووروەتا** / mûrûweta/: ناو. موورووییەکی شینە ☰ مُهرەای زینتی آبی رنگ

**مووروەچۆلەکە** / mûrûweçoleke/: ناو. بەری گیایەکە باریک و لوولەیی، ژنان خشڵی پێ دەگرنەوە و لە ملی دەکەن ☰ ثمر گیاهی است برای گردنبند استفاده می‌شود

**مووروەدەنگیلە** / mûrûwedengîle/: ناو. موورووییەکی خەیاڵییە لە هەقایەتی «سووری عەیاردار» قسە دەکا ☰ مُهرەای افسانەای کە گویا حرف می‌زند

**مووروەسەراو** / mûrûweseraw/: ناو. جۆرێ مووروە ☰ نوعی مُهرەی زینتی

**مووروەشیلان** / mûrûweşîlan/: ناو. جۆرێ موورووی سوورە لە دەنکە شیلان دەچێ، ملوانکەی پێ دەهۆننەوە ☰ نوعی مُهرەی زینتی

**مووروەشین** / mûrûweşîn/: ناو. موورووی شین؛ مووروەشینە؛ کانزایەکە بە ڕەنگی شینی تۆخ بۆ دەرمان دەشێ ☰ زاج کبود

**مووروەشینە** / mûrûweşîne/: ☜ **مووروەشین**

**مووروەقاچاخی** / mûrûweqaçaxî/: ناو. جۆرێک

مووررووی سێ گۆشەیە ملوانکەی پێ دەهۆننەوە ☰ نوعی مُهرەی زینتی

**مووررووەکەرانە** / mûrûwekerane/: ناو. مۆرەکە؛ موورگەکەوڵە؛ موورگەکەوەڵە؛ مووروەکەرانە؛ موورەکە؛ کووژەکە؛ خەرموورگ؛ گژک؛ گـژی ☰ خرمُهره

**مووررووەلەرزە** / mûrûwelerze/: ناو. جـۆرێ مووررووە ☰ نوعی مُهرەی زینتی

**موورە** / mûre/: ناو. ١. موور؛ پارچەی بە مشار بڕاو لە کۆتەدار ٢. پەلەپیتکە؛ بەردووکەی کە بە دوو پتە دەهاوێژرێ ٣. چەکوچ ٤. مۆرتخە ٥. موور؛ کۆمای دەخڵی دروێنەکراوی ئامادەی خەرمانکووب ٦. مۆرد؛ بڕبەند؛ سیسۆ ☰ ١. قطعەی با ارّە بریدە شدە از کُندە ٢. زاغوک ٣. چکش ۴. مهرەی فقرات ۵. تودەی غلەی آمادەی خرمنکوبی ۶. سوهان

**موورەت** / mûret/: ناو. بڕبەند؛ مرمەند؛ بڕەن؛ بڕوەن ☰ سوهان

**موورەغە** / mûreğe/: ☜ مۆرەغە

**موورەکە** / mûreke/: ☜ مووررووەکەرانە

**موورەکی** / mûrekî/: ناو. جۆرێ مێوژ ☰ نوعی مویز

**موورەگە** / mûrege/: ☜ مۆرەغە

**مووری** / mûrî/: ☜ مێرووله

**مووریسان** / mûrîsan/: ناو. شارەمێروو؛ کونا مرۆچە ☰ لانەی مورچگان

**موورێ** / mûrê/: ☜ مۆرەغە

**مووڕن** / mûřin/: ناو. بەری دەمووکانە ☰ ثمر مویزک

**مووڕەد** / mûřed/: ☜ مرمەند

**مووڕێژە** / mûřêje/: ناو. دەردی تووک لێ وەرین ☰ بیماری ریزش مو

**مووڕێس** / mûřês/: ناو. تەشیڕێس لە مووی بزن ☰ ریسندەی مو

**مووز** / mûz/: ناو. ١. مووزبەرە؛ جلیت؛ جریت ٢. جلیتبازی ☰ ١. چوبدستی سوارکاران در مسابقەی سوارکاری ٢. بازی سوارکاری با چوبدستی

**مووزبەرە** / mûzbere/: ☜ مووز-١

**مووزر** / mûzir/: ناوەڵناو. چاوچنۆک؛ چاونەزێر ☰ طمعکار

**مووزک** / mûzik/: ناو. کەوش؛ پێڵاو ☰ کفش

**مووزە** / mûze/: ناو. مووزەخانە؛ ئەنتیکەخانە ☰ موزە

**مووزەخانە** / mûzexane/: ☜ مووزە

**مووزەر**[١] / mûzer/: ناو. پۆڕ؛ زێوەکەو؛ سوێسکەڕەشە؛ مەلێکە نەختێ لە کەو گەورەتر ☰ دُرّاج

**مووزەر**[٢]: ناوەڵناو. لەشسپی و مووبۆر ☰ پوستسفیدِ مو بور

**مووزەرد** / mûzerd/: ناوەڵناو. سیسۆ ☰ بُور

**مووزەن** / mûzen/: ناو. کەمان؛ کەمانچە ☰ کمانچە

**مووزیک** / mûzîk/: ☜ مووسیقا

**مووس** / mûs/: ناو. ١. ماچ؛ ڕامووس؛ کاری ڕاموسان ٢. گووزان؛ گوێزان؛ تیغ یان چەقۆی سەر و ڕیش تاشین ٣. چەورە؛ گەڕیدە بۆ خواردن ☰ ١. بوسە ٢. اُستُره ٣. طفیلی

**مووسایا** / mûsaya/: ناوەڵناو. مووسایا؛ فێرکراو؛ هەڤۆتی ☰ تربیتشدە

**مووسایی**[١] / mûsayî/: ناو. جوو؛ جوولەکە؛ جوولە؛ یەهوودی؛ ئۆمەتی مووسای پەیغەمبەر ☰ یهودی

**مووسایی**[٢]: ناوەڵناو. جوولەکە؛ یەهوودی؛ پێوەندیدار یان سەر بە یەهوود ☰ یهودی

**مووسپی** / mûs(i)pî/: ناوەڵناو. دلهان؛ زاڵ؛ کەژ؛ کەسێ کە لە بەر تیشکی خۆر چاوی نادوونێ ☰ زال

**مووسڵدان** / mûsiłdan/: ☜ میزەڵدان

**مووسلی** / mûslî/: ناو. مووسیر؛ گیایەکە بنێکی

وەک پیوازی هەیە، خۆش دەکرێ و دەکرێتە نێو ماست و دەخرێتە ترشیاتەوە ☰ موسیر

**مووسم** / mûsim/: ناو. سەر نووکی سمـی ئـاژەڵ و یەکسم ☰ نُک سُم حیوان

**مووسەکە** / mûseke/: ☜ **نوسەکە**

**مووسەڵ** / mûsel/: ئاوەڵناو. زگ‌لـەوەڕێن؛ چـەورە؛ چلێس ☰ سورچران

**مووسەنەک**[1] / mûsenek/: ☜ **نوسەکە**

**مووسەنەک**[2]: ئاوەڵناو. ڕژد؛ چـرووک؛ چکـووس ☰ خسیس

**مووسیر** / mûsîr/: ☜ **موسڵی**

**مووسیقا** / mûsîqa/: نـاو. مۆسـیقا؛ مووزیــک؛ مۆزیک: ١. هونەری لە پاڵ یەک نانی دەنگ بـە لەبەرچاوگرتنی ڕیتم و میلۆدی و هارمۆنی ٢. ئەو هەوایە کە بەم شێوە بەدی دێ ☰ ١و٢. موسیقی

⊡ **موسیقای پـاپ**: مووسیقای هـۆنراو بـۆ خەڵـکی ئاسایی بەبێ ڕەچاو کردنی بنەماکانی مووسیقا ☰ موسیقی پاپ

**موسیقای جـاز**: مووسـیقای ڕەش‌پێسـتەکانی ئەمریکا کە ئێستاکە جەهانییە ☰ موسیقی جاز

**موسـیقای کلاسـیک**: جۆرێـــک مووســـیقای شوێنکەوتووی مۆسیقازانانی گەورەی ڕابـردوو، بەتایبەت بەرهەمەکانی سەدەی حەڤـدەهەم و هەژدەهەمی ئورووپا ☰ موسیقی کلاسیک

**موسیقای کۆن**: ١. مووسیقای هۆز یـا نەتـەوەیێ کـە لـە مێـژەوە بـاو بـووە ٢. ئاهـەنگ یـان گۆرانییـەک کـە دەنێـو دەزگاکـانی تایبـەتی مۆسیقای ئێرانیـدا هۆنرابێتـەوە ☰ ١. موسـیقی سنتی ٢. موسیقی سنتی ایرانی

**موسیقای ناوچەیی**: مووسیقای باوی ناو خەڵـک کە بە سەر زارەوە هاتووە و پارێزراوە ☰ موسیقی محلی

**مووسیقار** / mûsîqar/: نـاو. مۆسیقار؛ مووسیقاڕ: ١. کەسی ئاگا لە بنـەما و ڕێوشـوێنی مووسـیقا ٢. ئاهەنگساز ٣. ژەنیار ☰ ١. موسـیقیدان ٢. آهنگسـاز ٣. نوازنده

**مووسیقاڕ** / mûsîqař/: ☜ **موسیقار**

**مووسین** / mûsîn/: چاوگ. ڕامووسین؛ مـاچ کـردن ☰ بوسیدن

**مووش** / mûş/: ناو. ١. قڕوقپی لـە ترسـان ٢. ☜ **میت**[1]**ـ٣** ٣. زەمینی قەت نەکلێدراو ٤. مشک ☰ ١. سکوت از ترس ٢. ☜ **میت**[1]**ـ٣** ٣. زمین بـایر ۴. موش

⊡ **مووش پێکردن**: بێدەنگ کردن بە گـەف ☰ وادار به سکوت کردن

**مووش کردن**: مەخس کردن؛ بێـدەنگ بـوون لـە ترسان ☰ ساکت شدن

**مووشامبە** / mûşambe/: نـاو. مشـەما؛ مشـەمما ☰ مُشمع

**مووشـاندن** / mûşandin/: چـاوگ. بوورانـەوە؛ لـە هۆش خۆ چوون ☰ بیهوش شدن

**مووشانێ** / mûşanê/: ☜ **مێشێن**

**مـووش‌خورما** / mûşxurma/: نـاو. خورماسـیلک؛ سەرکەنک؛ مشکێکی تووک زروە بە گوێی کوڵ و کلکی تووکنەوە ☰ موش‌خُرما

**مووشن** / mûşin/: ئاوەڵناو. مووشە؛ چاوکز ☰ کم‌بین

**مووشۆکۆر** / mûşokor/: ☜ **مشکەکوێرە**

**مووشـە**[1] / mûşe/: نـاو. ١. چـاوی کـەمحـوکم ٢. مڵ‌ومۆ؛ مڵ‌ومووش ☰ ١. چشم کم سو ٢. عمل بـو کشیدن و گشتن دنبال خوراکی

⊡ **مووشە کـردن**: مڵ‌ومۆ کردن؛ گەڕان و بۆن کردن بۆ دۆزینـەوەی خواردەمـەنی ☰ بـو کشـیدن و گشتن دنبال خوراکی

**مووشە**[2]: ☜ **مووشن**

**مووشەدەمە** / mûşedeme/: ناو. دەمەی ئاسنگەر ☰ دم آهنگری

**مووشەڕەت / mûşeřet/**: ناو. حەواڵە؛ ناردراو بە تایبەتی بۆ جەهەندەم ‹بە جەحەندەمی مووشەڕەت کرد!› ☰ حواله به جهنم

**مووشەک[1] / mûşek/**: ناو. هاژەک؛ وژەک: ١. کەرستەیەک بە خەزێنەی سووتەمەنییەوە کە گازەکەی دەردەچێ و بەرەو پێشی دەبا ٢. کەرستەیەکی وا بۆ چەکی گەرم ☰ ١و٢. موشک

**مووشەک[2]**: ئاوەڵناو. مووشەکەر؛ زگڵەوەڕێن ☰ شکم‌چران

**مووشەکەر / mûşeker/**: ☜ مووشەک[2]

**مووشەمووش / mûşemûş/**: ناو. کاری بۆن‌کێشان و بۆگەڕان ☰ عمل موس‌موس کردن

**مووشێن / mûşên/**: ☜ مێشێن

**موفرک / mûfirk/**: ناو. ١. وردەپێشەی کلۆری لەش ٢. گرێڵەی هەودا ٣. سەر و ژێر و بۆر لە نووسیندا ☰ ١. سُلامی؛ استخوان‌های گرد و کوچک بدن ٢. گره کوچک در نخ ٣. اِعراب (فتحه، کسره و ضمه)

**موفەڕک / mûfeřik/**: ☜ متفەڕك

**موقەڵێش / mûqełêş/**: ئاوەڵناو. وردبین ☰ موشکاف

**موک / mûk/**: ناو. فرمێسکی درۆ ‹هاتووە مووکم بۆ هەڵدەڕێژێ! نازانێ من باشی دەناسم› ☰ اشک تمساح

**موکار / mûkar/**: ئاوەڵناو. زۆر تیژ (واتا: موو ئەکا) ‹بڕۆت تیغێکە وسمەی سەیقەل و مەسلوول و مووکارە/ کە عیشوەی جەوهەرە، ڕەمز و ئیشارەی ئاوی مەودایە «نالی»› ☰ بسیار تیز

**موکەش / mûkeş/**: ناو. ١. ☜ موچن ٢. دەویت؛ بێناموس ☰ ١. ☜ موچن ٢. جاکش

**موکێش / mûkêş/**: ☜ موچن

**موولە[1] / mûle/**: ناو. حەری؛ هەڕ؛ هەڕگ؛ قوڕ؛ لەوە ☰ گِل

**موولە[2]**: ئاوەڵناو. چکۆلە و سڵ (یەستر) ☰ کوچک و چموش (قاطر)

**موم / mûm/**: ☜ مۆم

**مومار / mûmar/**: ناو. زووری؛ مۆلک؛ مارمارک؛ کرمەپانە ☰ کرم کدو

**مومانە / mûmane/**: ناو. ئەو مووەی دیواری خەڵێفی پێ سواغ دەدرێ ☰ موی روی جدار کندو

**مومی / mûmî/**: ☜ مەیموون ـ٢

**مون[1] / mûn/**: ناو. هۆنە؛ هۆندراو ☰ بافته

**ـ مون[2]**: پاشەوشە. هۆنەر؛ هۆن ☰ ـ ریس

**موناندن / mûnandin/**: چاوگ. هۆنینەوە؛ بادان ☰ ریسیدن

**مونتەنە[1] / mûntene/**: چاوگ. هۆندنەوە؛ بادان ☰ تاب‌دادن

**مونتەنە[2]**: ئاوەڵناو. وەهۆنراو؛ بادریاگ ☰ تاب داده‌شده

**مونین / mûnîn/**: چاوگ. هۆندنەوە؛ بادان ☰ ریسیدن

**مووەڕزە / mûweř(i)ze/**: ناو. نەخۆشی تووکی سەر وەرین ☰ بیماری ریزش موی سر

**مووین / mûwîn/**: ☜ مووین

**موویش / mûyş/**: ☜ مشك ـ١

**مویکار / mûyhar/**: ناو. خەملینۆک؛ سەرتاش؛ جوانکەر ☰ آرایشگر

**موینە / mûyne/**: ئاوەڵناو. کوڵکن؛ تووکن ☰ پشمالو

**موینەکە / mûyneke/**: ناو. پنجە هەرزن ☰ بوتەی ارزن

**مویە / mûye/**: ☜ موـ١

**مووین / mûyîn/**: ئاوەڵناو. ١. مووین؛ چێکر لە موو؛ لە موو دروستکراو ‹کڵاوی مووین› ٢. زۆر باریک و ناسک، وەک موو ‹لوولەی مووین› ☰ ١. ساخته از مو ٢. موین

**مووینە / mûyîne/**: ناو. گیامووینە؛ گیایەکی ورد و تووکنە، پتر لە نێو وێنجە و مێرگان شین دەبێ ☰ گیاهی است

**مە[1] / me/**: جێناو. خۆمان؛ ئێمە ‹ئەو کچە جووانە کە مەی دەفرۆشن/ نازی چاوانە بە مەی دەفرۆشن «هەژار، *بۆکوردستان*»› ☰ ما

**مە-[2]**: پێشگر. ۱. بە سەرەتای کردارەوە دەلکێ و واتای بەرگری دروست دەکا ‹مەڕۆ؛ مەخۆ؛ مەچۆ؛ مەلێن؛ مەکەن› ۲. م ـ نیشانەی داهاتوو لە کاردا؛ دە؛ ئـ ‹واران مەوارۆ› ۳. نە؛ نا؛ نیشانەی نەفی کردنەوەی ئاوەڵناو و ناو ‹مەزا› ☰ ۱. مَـ ؛ نشانەی نفی ۲. می؛ نشانەی استمرار ۳. نا؛ صفت منفی‌ساز

**مەئافە / me'afe/**: ناو. کەژاوە ☰ کجاوە

**مەئەرس / me'ers/**: ناو. گەواد؛ دەویت ☰ جاکش

**مەبادا[1] / mebada/**: ناو. *[کینایە]* کاتی تەنگانە ‹بۆ ڕۆژی مەبادا ڕامگرتووە› ☰ هنگام ضرورت

**مەبادا[2]**: نزا. ۱. نەکەی؛ دەغیلە ‹مەبادا بە لای شتی وادا بچی!› ۲. وشەی دوودڵی ‹مەبادا هاتبێ و لە ماڵ نەبووبم!› ☰ ۱. زنهار ۲. نکند

**مەبال / mebal/**: ناو. مبال؛ مەوال؛ ئاودەست ☰ مُستراح

**مەبتکۆ / mebitko/**: ئاوەڵکار. ڕەنگە؛ شایەتا؛ شایەد ☰ شاید

**مەبرانی / mebranî/**: ☜ **مەگیرانی**

**مەبرە / mebre/**: ناو. غەزاڵ؛ کەژاڵ؛ خەزاڵ ☰ غزال

**مەبۆ / mebo/**: ئاوەڵکار. ۱. دەبێ؛ ڕێی تێ دەچێ ۲. ئەبێ؛ دەبێ؛ پێویستە ۳. نابێ؛ ناشێ ☰ ۱. ممکن است ۲. باید؛ بایستی ۳. نباید؛ غیرممکن است

**مەبەس / mebes/**: ☜ **مەبەست**

**مەبەست / mebest/**: ناو. مەبەس: ۱. ئامانج؛ دۆز؛ بەرگ؛ مەرام؛ کاربەند؛ ئەوەی هەوڵی بۆ دەدەن تا دەستی بخەن ‹مەبەستی ژیان› ۲. مخەت؛ چەمک؛ نیاز؛ سا؛ خواستە ‹مەبەستت لەم قسانە چییە؟› ☰ ۱. هدف ۲. منظور

**مەبەه / mebeh/**: ئاوەڵناو. گوشاد؛ هەراو؛ فرەه ☰ فراخ

**مەت / met/**: ☜ **مەتی**

**مەتا / meta/**: ☜ **مەتاع**

**مەتار / metar/**: ☜ **مادەر**

**مەتارە / metare/**: ناو. ۱. قمقمۆکەی سەفەری ۲. سارد و گەرم ☰ ۱. قُمقُمە ۲. فلاسک

**مەتارەک / metarek/**: پێرۆ. ← **هەتارەك و مەتارەك**

**مەتاع / meta'/**: ناو. مەتا؛ کالا؛ کەلپەلی بازرگانی ☰ کالا؛ متاع

**مەتالیک / metalîk/**: ناو. پارەی هەرە بچکۆلەی دەورانی عوسمانی ☰ پول خُرد دورەی عُثمانی

**مەتاڵ / metał/**: ناو. مەرتاڵ؛ قەڵغان ☰ سپر

**مەتر / metr/**: ☜ **میتر**

**مەترالێزە / metralêze/**: ناو. مەترەلۆ ☰ آتشبار

**مەتران / metran/**: ناو. ۱. زانای ئایینی فەلە پلە بالاتر لە ئەسقەف ۲. نێزەی درێژ بۆ ڕاوەماسی لە چەم ☰ ۱. کاردینال ۲. نیزەی مخصوص شکار ماهی

**مەترسی[1] / metirsî/**: ناو. هەتەر؛ خەتەر؛ بقە ‹ئەزانم لە ڕێگا/ مەترسی گەلێ ژەنگ و ژارن «سوارە»› ☰ خطر

**مەترسی[2]**: ئاوەڵناو. سامناک؛ جێ ترس ☰ ترسناک

**مەترسیدار / metirsîdar/**: ئاوەڵناو. جێ‌مەترسی؛ نەتەکن ‹گەمەی مەترسیدار؛ نەخۆشیی مەترسیدار› ☰ خطرناک

**مەترسیگا / metirsîga/**: ناو. تالووکە؛ تەلووکە؛ تالوکە ☰ مهلکە

**مەترکە / metirke/**: ناو. مەتلخە؛ ئەسپەرە ☰ جای پا در بیل آهنی

**مەترە / metre/**: ☜ **میتر**

**مەترەبار / metrebar/**: ناو. چەرچی ☰ پیلەور

**مەترەتی** / metretî/: ناو. دەفری کاشی بۆ تریت خواردن ☰ ظرف تریدخوری

**مەترەس** / metres/: ☜ **مەتەریز**

**مەترەق** / metreq/: ناو. کوتکی ئاسن ☰ پُتک آهنی

**مەترەلوێز** / metrelwêz/: ☜ **مترالیۆز**

**مەترەلۆز** / metreloz/: ☜ **مترالیۆز**

**مەتک** / met(i)k/: ☜ **مەتی**

**مەتکەب** / metkeb/: ناو. مەتکەو؛ ئامرازی دار کون کردن ☰ متّەی چوب سوراخ کردن

**مەتکەو** / metkew/: ☜ **مەتکەب**

**مەتلخە** / metilxe/: ☜ **مەترکە**

**مەتە** / mete/: ناو. ١. ئامرازی دار سمین ٢. ☜ **مەتی** ٣. تماشا ☰ ١. مته ٢. ☜ **مەتی** ٣. نگاه

⊡ **مەتە کردن**: تماشا کردن ☰ نگاه کردن

**مەتەخشەڵ** / metex(i)şeł/: ناو. بت؛ بوت؛ خوالە؛ ژوون ☰ بُت

**مەتەر** / meter/: ☜ **مادەر**

**مەتەرێ** / meterê/: سارستە. دایکێ؛ ئەی دایک ☰ ای مادر

**مەتەریز** / meterêz/: ناو. متەریز؛ مەترەس؛ مەتەرێس؛ سەنگەر؛ خەڵ؛ بۆسە «لێرەش لە نێو شەپۆلی خوێن و کەفدا/ لێرەش لە نێو مەتەریزی شەرەفدا «هێمن»» ☰ سنگر

**مەتەرێس** / meterês/: ☜ **مەتەریز**

**مەتەشا** / meteşa/: ☜ **متەشا**

**مەتەلگ** / metelig/: ناو. پارەی زۆر کەم و بێبایەخ ☰ پول کم و بی‌ارزش

**مەتەلۆس** / metelos/: ئاوەڵناو. پڕاوپڕ ☰ لبریز

**مەتەڵ** / meteł/: ☜ **مەتەڵۆک**

⊡ **مەتەڵ داهێنان**: لیچار پرسین ☰ چیستان پرسیدن

**مەتەڵ هەڵێنان**: زانینی لەگەز ☰ حل کردن چیستان

**مەتەڵۆک** / metełok/: ناو. مەتەڵ؛ مەتەڵۆکە؛ مەتەڵە؛ مەتهەڵۆک؛ مەتهل؛ مەتێڵە: ١. قەوسەل؛ چمام؛ چمامک؛ چەوچە؛ چەوچەو؛ فیشاردە؛ تشتانۆک؛ لیچار؛ دەناچیە؛ شتێکانی؛ قاف؛ پەردەک؛ گوتە یان نووسراوەیەک کە مەبەست و واتای شاردراوە و پێوارە ٢. مەتهەڵۆک؛ پەندی پێشینان ☰ ١. چیستان ٢. امثال و حکم

**مەتەڵۆکە** / metełoke/: ☜ **مەتەڵۆک**

**مەتەڵە** / metełe/: ☜ **مەتەڵۆک**

**مەتهەلۆک** / methelok/: ☜ **مەتەڵۆک ـ٢**

**مەتهەڵۆک** / methełok/: ☜ **مەتەڵۆک**

**مەتی** / metî/: ناو. ماتک؛ مەت؛ مەتە؛ مەتیە؛ مەتێ؛ مەتک؛ پلە؛ پلک؛ خوشکی باوک ☰ عمه

**مەتیە** / metye/: ☜ **مەتی**

**مەتێ** / metê/: ناو. ١. ☜ **مەتی** ٢. درێشەی پینەچی ☰ ١. ☜ **مەتی** ٢. درفش پینەدوز

**مەتێزا** / metêza/: ناو. پوورزا؛ منالی مەت ☰ عمّەزادە

**مەتێڵە** / metêłe/: ☜ **مەتەڵۆک**

**مەجاز** / mecaz/: ناو. ١. مەزاج؛ تەبیات؛ خدە؛ خوو ٢. /وێژەیی/ خوازە؛ وشەیێ کە لە مانایێکی‌تر جگە لە مانای سەرەکی خۆی بە کار بچێ (وەک «شێر» بە مانای بەهێز و دلێر) ☰ ١. خو؛ عادت ٢. مَجاز

**مەجازی** / mecazî/: ئاوەڵناو. ڕواڵەتی؛ ناڕاستەقینە ☰ مَجازی

**مەجال** / mecal/: ناو. دەرفەت؛ کێس ☰ مجال

**مەجبوور** / mecbûr/: ئاوەڵناو. ناچار؛ ناعیلاج؛ مەژبوور ☰ ناگُزیر؛ مجبور

**مەجبووری** / mecbûrî/: ☜ **ناعیلاجی**

**مەجحمە** / meciĥme/: ☜ **مەجومعە**

**مەجرووم** / mecrûm/: ناو. ئەستێرەیەکە لە ئاسمان

🇮🇷 ستاره‌ای است

**مەجرەف** / mecref/: ناو. کۆلکەی زل کە دەکرێتە تەختە 🇮🇷 کُندەی بزرگ که از آن تخته سازند

**مەجلیس** / meclîs/: ناو. مەلیس؛ کۆڕ؛ مەکۆ 🇮🇷 مجلس

**مەجمە** / mecme/: ☜ مەجومعە

**مەجمەعە** / mecim'e/: ☜ مەجومعە

**مەجنوون** / mecnûn/: ناوەڵناو. لێوە؛ شێت ‹مەجنوونی دو گیسوویی چ لەیلایەکە ئاخۆ؟/ یا وامیقی جادوویی چ عەزرایەکە ئاخۆ؟ «بێخود»› 🇮🇷 مجنون؛ دیوانه

**مەجوحمە** / mecuĥme/: ☜ مەجومعە

**مەجوعمە** / mecu'me/: ☜ مەجومعە

**مەجومعە** / mecum'e/: ناو. مەجمە؛ مەجحمە؛ مەجمەعە؛ مەجوعمە؛ مەجوحمە؛ مەعجۆمە؛ مەژمە؛ سینی 🇮🇷 سینی

**مەجووس** / mecûs/: ناو. ١. زەردەشتی ٢. ئاگرپەرست 🇮🇷 ١. زرتُشتی ٢. آتش‌پرست

**مەجەڕ** / meceř/: ناو. دراوێر؛ جۆرێ کومێد بە چەن کەشاوەوە 🇮🇷 دراور

**مەجیدی** / mecîdî/: ناو. ١. جۆرێ هەنجیر ٢. مەژدە؛ مەژیدە؛ مەیژدە؛ میژدە؛ پوولێکی سەردەمی عوسمانی 🇮🇷 ١. نوعی انجیر ٢. واحد پولی در دولت عثمانی

**مەجیرانی** / mecîranî/: ناو. بێزگ؛ بێزوو؛ مەگیرانی 🇮🇷 ویار

**مەچت** / meçit/: ☜ مزگەوت

**مەچچت** / meççit/: ☜ مزگەوت

**مەچک** / meçik/: ☜ مەچەك

**مەچەک** / meçek/: ناو. مەچک؛ قۆڵ 🇮🇷 مُچ

**مەچەکپێچ** / meçekpêç/: ناو. زەندووک؛ قۆڵچاخ؛ پارچەی باسکپۆش، وەک سۆرانی، بۆ کار 🇮🇷 بازوپوش برای کار

**مەچەکە** / meçeke/: ناو. ئامرازێکی ئاسیاوە لە دۆلاشدا 🇮🇷 ابزاری در آسیاب

**مەچەڵ** / meçeł/: ناوەڵناو. گەپجاڕ؛ گاڵتەجار 🇮🇷 مسخره

**مەچیت** / meçît/: ☜ مزگەوت

**مەچیر** / meçîr/: ناو. داوە بەن؛ تاڵ 🇮🇷 تارِ نخ

**مەچێ** / meçê/: ناو. مزگەوت؛ مزگت 🇮🇷 مسجد

**مەچێتر** / meçêtir/: ناو. *[کینایە]* جنۆکە 🇮🇷 جن

**مەحانج** / meĥanc/: ☜ محانج

**مەحبووب** / meĥbûb/: ناوەڵناو. ١. خۆشەویست؛ خوەشەویس ٢. گراوی؛ ماشقە 🇮🇷 ١. محبوب ٢. معشوقه

**مەحبووبە** / meĥbûbe/: ناوەڵناو. مەحبووب؛ گراوی 🇮🇷 معشوقه

**مەحتەل** / meĥtel/: ناوەڵناو. ١. ماتڵ ‹لەوێ زۆر مەحتەل بووم› ٢. داماو ‹خودا مەحتەلت نەکا!› ❋ هەروەها: **مەحتەلی** 🇮🇷 ١. مُعطل ٢. درمانده

⊡ **مەحتەل کردن**: ماتڵ/ دەستەوەستان کردن ‹میرزا نابێ مەحتەلم کەی، من ئەمشەو دەبێ بچمە بەغدا! «هەژار، چێشتی مجێور»›. هەروەها: **مەحتەل بوون** 🇮🇷 مُعطل کردن

**مەحتەل مان**: ١. ماتڵ بوون ٢. دامان؛ حەپەسان ‹وەهای جواب داوە گورج و تونووتۆڵ/ گزیر مەحتەل ما، وەک گای سەر سەهۆڵ «حەقیقی»› 🇮🇷 ١. معطل شدن ٢. واماندن

**مەحجووب** / meĥcûb/: ناوەڵناو. بەشەرم و حەیا 🇮🇷 محجوب

**مەحچە** / meĥçe/: ناو. گیای خڕنووک 🇮🇷 گیاهی است

**مەحرەم** / meĥrem/: ناوەڵناو. *[ئیسلام]* مەرەم: ١. خزمایەتیێ کە ژن و ژنخوازی لەگەڵیدا حەرامە ٢. تایبەتمەندی ئەو کەسەی بە پێی قانوونی شەرع پێویست ناکا ژن سەر و رووی لێ داپۆشێ

🇮🇷 ١و٢. محرم

**مەحشەر** / meĥşer/: ناو. ١. ڕۆژی قیامەت؛ سەلا ٢. چەقە و گوڕە و تێکەوە هاویشتن ‹بازاڕ مەحشەرە› 🇮🇷 ١. محشر ٢. هنگامه و جاروجنجال

**مەحف** / meĥf/: ☜ مەحو

**مەحفویر** / meĥf(i)wîr/: ☜ مافووره

**مەحفویرک** / meĥf(i)wîrik/: ☜ مەحفیرك

**مەحفوور** / meĥfûr/: ☜ مافووره

**مەحفوویر** / meĥfûyr/: ☜ مافووره

**مەحفەرە** / meĥfere/: ناو. سندووق؛ سنۆق 🇮🇷 صندوق

**مەحفیر** / meĥfîr/: ☜ مافووره

**مەحفیرک** / meĥfîrik/: ناو. مەحفویرک؛ قالیچە 🇮🇷 قالیچه

**مەحکووم**[1] / meĥkûm/: ناو. ئەوەی لە دادگا بە تاوانبار دەرچووە ‹مەحکووم ڕاوەستێ› 🇮🇷 محکوم

**مەحکووم**[2]: ئاوەڵناو. ١. داماو لە سەلماندنی ڕاستی قسە و داخوازی خۆدا ‹لە دادگادا مەحکووم بوو› ٢. ناچار بە قەبووڵ کردنی دۆخێکی ناخۆش و نالەبار ‹مەحکووم بە تەنیایی› 🇮🇷 ١و٢. محکوم

**مەحکەم**[1] / meĥkem/: ئاوەڵناو. قایم؛ پتەو؛ توند و گورج ‹دەرک و دەروازەی مەحکەم› 🇮🇷 مُحکم

**مەحکەم**[2]: ئاوەڵکار. توند؛ بە تەوژم ‹مەحکەم بیکوتە!› 🇮🇷 تند

**مەحکەمە** / meĥkeme/: ناو. ١. دیوەخانی قازی؛ دیوانی بە شکات ڕاگەیشتن ٢. مەتەب؛ جێگەیێ کە بژیشک نەخۆشی لێ دەبینێ 🇮🇷 ١. محکمه ٢. مطب

**مەحموودئاغایی** / meĥmûd'ağayî/: ناو. جۆرێک ترێی دەنک گەورەیە 🇮🇷 نوعی انگور درشت

**مەحموودی**[1] / meĥmûdî/: ناو. سکەی زێڕی عوسمانی 🇮🇷 سکەی طلای عُثمانی

**مەحموودی**[2]: ئاوەڵناو. ئازا و بەقەوەت (فیل) 🇮🇷 قدرتمند (فیل)

**مەحو** / meĥ(i)w/: ئاوەڵناو. مەحف؛ ماهف؛ سڕاو؛ لەناوچوو ‹شەو، هەموو شەو چاوەڕییە ڕۆژ هەڵێ، هەر ڕۆژ هەلات/ مەحوە سەر تا پا لە بەر پێتا فیداکارانە شەو «مەحوی»›. هەروەها: **مەحو بوونەوە؛ مەحو کردنەوە** 🇮🇷 محو

**مەحەک** / meĥek/: ناو. محەک؛ ١. تێساو؛ سەنگی مەحەک؛ بەردی ڕەشی سیلیسی زێڕئەزموو ‹خالیسە سیککەی ئیخلاسی دلی موخلیسی من/ بیخە نێو بۆتە، چ حاجەت بەمە بیدەی لە مەحەک «حاجی قادر»› ٢. ئامێر یان پێومانی دەرخستنی چۆنیەتی یان ڕەسەنایەتی شتێک ‹بێ مەحەک هەر کەس ئەبینی ڕازی دلتی لا مەکە!/ بۆ قسەی پووچ و درۆ هەرگیز لەگەڵ کەس ڕا مەکە! «موفتی پێنجوێنی»› 🇮🇷 ١و٢. محک

⊡ **لە مەحەک دان**: ١. ساوین بە سەر بەردی مەحەکدا ٢. هەڵسەنگاندن و تاقی کردنەوەی چۆنیەتی یان ڕەسەنایەتی شتێک 🇮🇷 ١و٢. محک زدن

**مەحەلە** / meĥele/: ☜ محەلە

**مەحەلەجەنگێ** / meĥelecengê/: ناو. شەڕەگەڕەک؛ پەڤچوونی دوو تاخ 🇮🇷 جنگ میان دو محلّه

**مەحەلەق** / meĥeleq/: ☜ محەلەق

**مەخابن** / mexabin/: ☜ مخابن

**مەخت** / mext/: ناو. مژ؛ ملک؛ کاری بە دەم مریستن 🇮🇷 مُک

**مەختە**[1] / mexte/: ناو. قەبەڵ؛ قۆنتەرات؛ کاری سەرلەبەر 🇮🇷 کُنترات

**مەختە**[2]: ئاوەڵناو. مژراو؛ مریسی 🇮🇷 مکیده

**مەختەر** / mexter/: ☜ مەیتەر

**مەخرا** / mexra/: ناو. ئەشکەوت 🇮🇷 غار

**مەخرک** / mexrik/: ناو. دوژمن؛ دژ؛ نەیار 🇮🇷 دشمن

**مەخرەب** / mexreb/: ☜ **مەغریب**

**مەخس** / mexs/: ئاوەڵناو. بێدەنگ لە ترسان 🇮🇷 ساکت از ترس

◘ **مەخس کردن**: ☜ **مووش کردن**

**مەخشەڵ** / mexşeł/: ☜ **مەشخەڵ**

**مەخشەلان** / mexşełan/: ☜ **مەشخەلان**

**مەخشی** / mexşî/: ☜ **مێش**

**مەخل** / mexl/: ناو. هەرەتی چنینی ڕەز لە پاییزدا 🇮🇷 موسم چیدن انگور در پاییز

**مەخلووتە** / mexlûte/: ناو. دانوولە؛ دانەکولانە؛ شێوی گەنم و نیسک و دانەوێڵەی‌تر 🇮🇷 آش دندانک

**مەخلووق** / mexlûq/: ناو. ١. مەردم؛ کۆمەڵی بنیادەم ‹بە پەل ـ پەل کردنی سبحەی ئەگەر ببوایە باوەڕیان/ دەبوو قەت بەم حەدە نەبوایە بۆ دنیا پەلەی مەخلووق «مەحوی»› ٢. دەسکاری خوا 🇮🇷 ١. مردُم ٢. آفریده

**مەخلووقات** / mexlûqat/: ناو. خەڵک بە گشتی 🇮🇷 مردم به طور عام

**مەخلەمە** / mexleme/: ناو. مێخلەمە؛ قیمە و هێلکەی پێکەوە سوورەوەکراو 🇮🇷 خوراک گوشت چرخ‌کرده و تخم‌مرغ

**مەخڵگە** / mexiłge/: ناو. تەویلەی مەڕ 🇮🇷 آغُل

**مەخمخین** / mexm(i)xîn/: چاوگ. هەلاهەلا بوون لە بەر کولانی زۆر 🇮🇷 از هم پاشیدن از زیاد پُختن

**مەخموور** / mexmûr/: ☜ **مەخمەڵ**

**مەخمەر** / mexmer/: ☜ **مەخمەڵ**

**مەخمەسە** / mexmese/: ناو. قەرقەش؛ گێرە و کێشە؛ دەرد و ئەرک 🇮🇷 مخمصه

**مەخمەلەک** / mexmelek/: ناو. دەسرۆکەی ناسک لە تەنزیل 🇮🇷 دستمال از پارچەی نازُک

**مەخمەڵ**[١] / mexmeł/: ناو. مەخمەر؛ مەخموور؛ فرەز؛ مخموور؛ قەدیفە؛ قوماشی یەک‌لا کورکن لە ئاوریشمی ئاسایی یان دەسکرد 🇮🇷 مخمل

**مەخمەڵ**[٢]: ناو. مەخمەر؛ مەخموور؛ مخموور؛ مەخمەڵی؛ لە جنسی مەخمەڵ ‹قوماشی مەخمەڵ› 🇮🇷 مخملی

**مەخمەلی** / mexmelî/: ☜ **مەخمەڵ**[٢]

**مەخمەلێنە** / mexmełêne/: ناو. قریژەبەرد؛ کرێژ 🇮🇷 گُلسنگ

**مەخەر** / mexer/: ناو. ١. زەوی نەرمان و ڕاست ٢. دەمووکانە؛ دارخوەرەک 🇮🇷 ١. زمین نرم و هموار ٢. داروایش

**مەخەرا** / mexera/: ☜ **مەغارە**

**مەخەل** / mexel/: ناو. مەغەل؛ مخول؛ مۆڵگە؛ جێگەی کۆ بوونەوە و نوستنی حەیوانات 🇮🇷 استراحتگاه حیوانات

**مەخەلەسە** / mexelese/: ناو. گوڵەئاوات؛ گوڵە ئاخ 🇮🇷 گُل میمون

**مەخەڵ** / mexeł/: ناو. ١. پەرداخ؛ مشت‌ومال‌دراو ٢. لەوەڕ و مێرگی پاوان 🇮🇷 ١. جلاداده شده ٢. مرتع اختصاصی

**مەخین** / mexîn/: ناو. ناوێکە بۆ ئاشووری 🇮🇷 آشوری

**مەدادە** / medade/: ئاوەڵناو. درێژەوەبوو لە سەر زەوی 🇮🇷 دراز کشیده بر زمین

**مەدار** / medar/: ناو. ١. کێڵگە ٢. ئاشی کرە 🇮🇷 ١. مزرعه ٢. نوعی آسیاب

**مەداڵ** / medał/: ☜ **میداڵ**

**مەددە** / medde/: ناو. هەڵکشاوە؛ نیشانەی دەنگ درێژ کردن لە سەر پیتی نووسراو 🇮🇷 علامت مدّ بر حروف

**مەدرەب** / medreb/: ناو. ١. دارستانی پاوان ٢. بەراو؛ زەمینی ئاوی 🇮🇷 ١. جنگل قُرُق ٢. زمین آبی

**مەدرەسە** / medrese/: ناو. فێرگە؛ قوتابخانە؛ جێگەی هەڤۆتن 🇮🇷 مدرسه

**مەدرەسەیی** / medreseyî/: ناو. قوتابی؛

خوێندکاری قوتابخانە ‹خیابان سیرووس کووچەی سەییەکان/ یاخوا زوو بێنەو مەدرەسەییەکان «حەق‌شناس»› ▀ محصل

**مەدرەک / medrek/**: ناو. بەڵگە؛ شانەک ‹مەدرەکێ عیلمێ زەمیرێ شەممەیەک وەسفا تە هات/ وەر نە کەی عالەم ب شەئنێ قەدر و میقدارێ تە بێ «مەلای جزیری»› ▀ مدرک

**مەدفین / medfîn/**: ناو. گۆشتی ناو پلاو ▀ گوشت لای پلو

**مەدلمە / medilme/**: ئاوەڵناو. شل و شەوێق؛ سست و شل و ول ▀ شُل و وِل

**مەدونە / medune/**: ناو. خاکەناز؛ بێڵۆکەی خۆڵەمێش دەردان ▀ خاک‌انداز

**مەدوونە / medûne/**: ☜ **مەندوونە**

**مەدە / mede/**: ناو. ١. مەعدە؛ کرش ٢. ئیشتیای خواردن ‹مەدەم نایە› ▀ ١. معده ٢. اشتها

**مەدەد / meded/**: ناو. یارمەتی؛ فریاڕەسی ▀ مدد

**مەدەدکار / mededkar/**: ناو. ئاریکار؛ فریاڕەس ▀ مددکار

**مەدەر / meder/**: ناو. ١. کەستەک؛ کلۆگڵ ٢. تکا؛ ئەرجوو؛ شفات ▀ ١. کلوخ ٢. شفاعت

**مەدەک[1] / medek/**: ☜ **ماداك**

**مەدەک[2]**: ئاوەڵکار. سەردەمێ؛ وەختێ ▀ یک وقت

**مەدەلایی / medelayî/**: ☜ **مەدەنۆس**

**مەدەنۆس / medenos/**: ناو. جافری؛ مەعدەنووس؛ مەدەنووس؛ مەیدنۆز؛ مەیلنۆز؛ مەدەلایی؛ یەکێ لە جۆرەکانی سەوزەوات ▀ جعفری

**مەدەنوس / medenûs/**: ☜ **مەدەنۆس**

**مەر[1] / mer/**: ناو. ١. پێمەرە؛ بێڵی ئاسن ٢. گۆزە؛ جەرە ▀ ١. بیل آهنی ٢. کوزه

**مەر[2]**: ئاوەڵکار. مەگەر؛ مەگین ‹مەر من لە زومرەی خەڵک خودا نیم؟/ هیچ ساتێ لە دەس مەینەت ڕەها نیم «فولکلۆر»› ▀ مگر

**مەراخان / meraxan/**: ☜ **ماڵەغان**

**مەرازە / meraze/**: ☜ **مەلازە**

**مەراس / meras/**: ناو. کاری ڕاو دابەشینەوە بۆ نچیر پەیدا کردن ▀ تقسیم شکارگاه بین شکارچیان

**مەراش / meraş/**: ئاوەڵناو. بێ‌ڕەواج؛ بێ‌بڕەو؛ بێ‌ڕمێن ▀ بی‌رواج

**مەراشتن / meraştin/**: چاوگ. لە بڕەو خستن؛ بێ‌ڕمێن کردن ▀ از رواج انداختن

**مەرافە / merafe/**: ناو. شەڕ؛ کێشە ‹شامی مەرافەی ڕوین نەواتی/ هەستید دادە باد، خستەدە لاتی «شامی»› ▀ مُرافعه

**مەراڤی / meravî/**: ☜ **مراوی**

**مەراق / meraq/**: ناو. مەرەق: ١. تاسە و ئارەزوو ‹ـ دەتوانم دەستی لێ دەم؟ ـ نا، مەمنووعە ـ کوڕە دەستی لێ نەدەم لێم دەبێتە مەراق و خەوم لێ ناکەوێ! «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. خەم و کوڵ ‹مەراقە لە دڵی زمانی کوردییا، مەراقە:/ لە بەر چی دار مێوی شیعری تۆ کۆچی کرد؟ «شێرکۆ»› ▀ ١. آرزو ٢. غم؛ اندوه

**مەراڵ / merał/**: ناو. ئاسک؛ کەژاڵ؛ مامز؛ مامبز؛ خەزاڵ ▀ آهو

**مەرام / meram/**: ناو. مەرەم؛ دۆز؛ مەبەستی دڵ ▀ مرام

**مەران / meran/**: ناو. بنەیاسەمەن ▀ درختچەی یاسمن

**مەراندن / merandin/**: چاوگ. ڕاوەشاندن؛ جووڵاندن ▀ تکان دادن

**مەرایی / merayî/**: ناو. دووڕوویی؛ زمانلووسی؛ ڕیایی ▀ ریا؛ تملّق

**مەرایی‌کەر / merayîker/**: ئاوەڵناو. دووڕوو؛ ڕیاکار ▀ ریاکار

**مەربێل / merbêl/**: ناو. بێل؛ مەرە ▀ بیل

**مەرتاڵ / mertał/**: ☜ **مەتاڵ**

**مەرتاندن** / mertandin/: ☜ **مەڕتاندن**

**مەرتەبا**[1] / merteba/: ناو. پلە و پایە و ڕێز ☲ مرتبه

**مەرتەبا**[2]: ئاوەڵناو. ڕاست و بێ‌خێچی و خـواری ☲ راست و مُستقیم

**مەرتەبە** / mertebe/: ناو. پایە؛ پلەوپایـە؛ کۆڵـەکە یا جێگای کەسێ یان شتێک ☲ پایه

**مەرتین** / mertîn/: چاوگ. کـەوڵ کـردن؛ تـوێژ و پێست لابردن ☲ پوست کندن

**مەرج** / merc/: ناو. ١. بەڵێن؛ گفت؛ قەول؛ پەیمان ‹دەستی منی خستە دەستییەوە و گوتی: ئەم کوڕەم بۆ هێناوی، گۆشتی بۆ تۆ، ئێسکی بـۆ مـن. شـەرت و مەرجی قوتابخانە چییە؟ «هەژار، چێشتی مجێـور»› ٢. گرێو؛ شەرت ‹بارزانی زانی مردن و لە ناو بـردنی شۆڕشی زۆر لەوە بە شەرەفترە کە ئەو مەرجانە قبوول کـا و سـەری بـۆ ئـەو نەنگـە شـۆڕ کـا «هـەژار، *بـۆ کوردستان*»› ٣. مان؛ دۆخی وەستانی خولخولۆکە و مزراح لە شوێنی خۆی لە کاتی خولانـەوەدا ☲ ١. پیمان ٢. شرط؛ شـرایط ٣. حالـت ایسـتادن گردنـا هنگام چرخش

▣ **مەرج دانان**: شـەرت دیـاری کـردن ☲ شـرط گذاشتن

**مەرج کردن**: ١. گرێـو کـردن ٢. مـان کـردن؛ ڕاست وەستانی خولخولە و مەزرێح، لـە نـاوی سووڕانەوەدا ☲ ١. شرط بستن ٢. ایستادن گردنا

**مەرجان** / mercan/: ناو. مـرژان: ١. گیانـدارێکی زەریایی کە لە ئاوی گەرمدا بە کۆمـەڵ دەژی ٢. بسـتام؛ بـزگ؛ بـزک؛ کـۆراڵ؛ پاشمـاوەی ڕەق هەڵاتووی ئەم گیانـدارە کـە لـە گەوهەرسـازی و سسلە و پێلەسازیدا کەڵـکی لـێ وەردەگـرن ☲ ١و٢. مرجان

**مەرجانۆک** / mercanok/: نـاو. گیایەکـە گوڵـی سووری ورد دەکا ☲ گیاهی است

**مەرجانە** / mercane/: ↓

▣ **مەرجانەی جادوو**: ١. نـاوی ژنی سـیحربازی چیرۆکـان ٢. */کینایە/* پیرێـژنی زۆر فێڵـەزان و بەمەکر ☲ ١. نام زن جادوگر افسانەهـا ٢. پیـرزن مکاره

**مەرجدار** / mercdar/: ئاوەڵناو. بەمەرج ‹دانوسـتانی مەرجدار› ☲ مشروط

**مەرجوو** / mercû/: ☜ **مەرژی**

**مەرجی** / mercî/: ☜ **مەرژی**

**مەرچقاندن** / merç(i)qandin/: چاوگ. بە سـەری پەنجە گووشینی کوان و دمەڵ بـۆ کـێم دەردان ☲ فشردن دُمل برای کشیدن چرک آن

**مەرچلە** / merç(i)le/: نـاو. چۆلەکـە؛ مـەلیچک ☲ گُنجشک

**مەرحووم** / merĥûm/: ئاوەڵـناو. ڕەحمـەتی؛ خـوا لێ‌خۆش‌بوو؛ ڕەوانشاد (بۆ مـردووی دەڵـێن) ‹ئـەو ماینە پیرەی زین هەڵچراوە/ مەرحوومی باوکم بـۆمی داناوە «قانع»› ☲ مرحوم

**مەرحەبا**[1] / merĥeba/: نـاو. مەرحـەوا؛ سـلام و سەفا ☲ سلام

**مەرحەبا**[2]: نزا. مەرحەوا ☲ مرحبا

**مەرحەمۆک** / merĥemok/: نـاو. جۆرێـک خشڵـی ژنانەیە ☲ نوعی زیورآلات زنانه

**مەرحەمە** / merĥeme/: نـاو. پـژگیر؛ پشـتەماڵ؛ خاولی؛ قەدیفە ☲ حوله

**مەرحەمەت** / merĥemet/: نـاو. بـەزەیی؛ ئـاوڕ وە سەر دانەوە ‹موحتاجی مەرحەمەتییە چ ناکـەس، چ کەس، بە گەل/ ئەو تاقە بێکەسێکە کە گرتی خودا بە کەس «مەحوی»› ☲ مرحمت

**مەرحەوا** / merĥewa/: ☜ **مەرحەبا**

**مەرخ** / merx/: نـاو. ١. جێگەی بە چاڵ و چۆل ٢. سەوڵی کێوی؛ دارێکی لێرەوارە زۆر عـومر دەکـا ٣. تەختی چەم ٤. مێرگ ☲ ١. چالەچوله ٢. سـرو کوهی ٣. مسیر رودخانه ۴. مرغزار

**مەرخان**[1] / merxan/: چاوگ. ئیخ خواردن 🇮🇷 خوابیدن حیوان

**مەرخان**[2]: ☜ **ماڵەغان**

**مەرخاندن** / merxandin/: چاوگ. ئیخ دان؛ خەواندنی پاتاڵ و یەکسم 🇮🇷 خواباندن حیوان

**مەرخوتا** / merxuta/: ناو. ۱. شێوی تێکەڵاو لە چەند دانەوێڵە ۲. شۆربای نیسکی هاڕاو 🇮🇷 ۱. آشی مخلوط از حبوبات ۲. شوربای عدس پوست‌کنده

**مەرخوز** / merxuz/: ئاوەڵناو. ئازا؛ بەجەرگ؛ ڕەشید 🇮🇷 شُجاع

**مەرخوزار** / merxuzar/: ناو. چیمەن؛ گیاجاڕ 🇮🇷 چمن؛ مرغزار

**مەرخەز** / merxez/: ناو. مەرەز؛ کوڵکی نەرمی جۆرێ بزن 🇮🇷 مرغُز؛ کُرک نوعی بُز

**مەرد** / merd/: ئاوەڵناو. ۱. ئازا لە شەڕ ۲. خاوەن پیاوەتی 🇮🇷 ۱. شُجاع ۲. نیکوکار

**مەردا** / merda/: ناو. ۱. ☜ **مردو** ۲. *[کینایە]* نەخۆشی لە مردن 🇮🇷 ۱. ☜ **مردو** ۲. بیمار مُشرف به مرگ

**مەرداب** / merdab/: ☜ **میراو**

**مەردازا** / merdaza/: ناو. جوامێر؛ چامێر؛ مێرخاس ‹جا ئەگەر خۆشم ئازا نیم، لە پیاوی ئازا خۆشم دێ. پێم خۆشە ئێوەش وەکوو من ئەو مەردازایە بناسن «هەژار، *چوار ناملکە*»›. هەروەها: **مەردازایی** 🇮🇷 جوانمرد

**مەرداسەنگ** / merdaseng/: ☜ **مردارسەنگ**

**مەردان**[1] / merdan/: چاوگ. بە پێمەڕە کێلان 🇮🇷 با بیل شخم زدن

**مەردان**[2]: ناو. ۱. چەکوچ ۲. پێمەڕەکاری 🇮🇷 ۱. چکش ۲. بیلکاری

**مەردانە**[1] / merdane/: ئاوەڵناو. پیاوانە ‹خەباتی مەردانە› 🇮🇷 مردانه

**مەردانە**[2]: ئاوەڵکار. پیاوانە؛ بە کرداری مەرد ‹دنیا کە هیچە، جوملە دەزانن، کەچی چ کەس/ مەردانە بۆ خودا نییە دەس هەڵگرێ لە هیچ «مەحوی»› 🇮🇷 مردانه

**مەردایەتی** / merdayetî/: ناو. مەردی: ۱. ئازایی؛ بوێری ‹چاکی مەردایەتی بە لادا کردن› ۲. جوامێری ‹لەم ژینە کە هەر دەمێکە، دێت و دەڕوا/ مەردایەتی مەفرۆشە لە پێناو تاوێک «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› 🇮🇷 ۱. شُجاعت ۲. رادمردی

**مەردش** / merdiş/: ئاوەڵناو. ۱. ☜ **مردو** ۲. لە ناوا نەماو 🇮🇷 ۱. ☜ **مردو** ۲. از بین رفته

**مەردم** / merdim/: ناو. خەڵک؛ کۆمەڵانی بنیادەم 🇮🇷 مردُم

**مەردمئازار** / merdim'azar/: ئاوەڵناو. دڵچڕ؛ بەدفەڕ 🇮🇷 مردم‌آزار

**مەردمازاری** / merd(i)mazarî/: ناو. کاری عەزیەت دانی خەڵک 🇮🇷 مردم‌آزاری

**مەردمەی** / merd(i)mey/: ☜ **مەردومی**

**مەردوڕند** / merd û řind/: ☜ **مەردوڕەند**

**مەردوڕەند** / merd û řend/: ئاوەڵناو. مەردوڕند؛ زۆر بە پیاوەتی و ئازایەتی ‹زێڕ بەڵایە، بێوەفایە دەوڵەمەند/ هەر هونەر نەمرە، هونەروەر مەردوڕەند «هێمن»› 🇮🇷 جوانمرد

**مەردوم**[1] / merdum/: ناو. ۱. مەردم؛ خەڵک ۲. خزم؛ خوێش 🇮🇷 ۱. مردم ۲. خویشاوند

**مەردوم**[2]: جێناو. تاقە کەسێک 🇮🇷 اَحدی

**مەردومەردانە** / merd û merdane/: ئاوەڵناو. جوامێرانە؛ پیاوانە 🇮🇷 مردانه

**مەردومی** / merdumî/: ناو. مەردمەی: ۱. پیاوەتی؛ مرۆڤایەتی ۲. خزمایەتی 🇮🇷 ۱. مردانگی ۲. خویشاوندی

**مەردوخ** / merdox/: ئاوەڵناو. نزیک لە مردن (نەخۆش) 🇮🇷 مُشرف به مرگ (بیمار)

**مەردوشو** / merdûşor/: ناو. تاتەشوار؛ ئەو جێگەی

مردووی لە سەر دەشۆن ☰ سکوی غُسل میّت

**مەردە** / merde/: ☜ **مردوو**

**مەردەئاو** / merde'aw/: ناو. ئارەقی ساردی لەش لە کاتی ترس و ڕاچڵەکیندا ☰ عرق سرد بدن

**مەردەزیندە** / merdezînde/: ☜ **مەردەوزیندە**

**مەردەزیننە** / merdezînne/: ☜ **مەردەوزیندە**

**مەردەشۆر** / merdeşor/: ☜ **مردوشۆر**

**مەردەشۆرخانە** / merdeşorxane/: ☜ **مردوشۆرخانە**

**مەردەک** / merdek/: ناو. کەللا؛ هەڵمات؛ مەڕمەڕ ☰ تیله

**مەردەکی** / merdekî/: ئاوەڵناو. ١. نەخۆشی لە مردن ٢. وەک مردوو ☰ ١. مُشرف بە مرگ ٢. مُردەسان

**مەردەڵا** / merdeła/: ناو. میرات؛ کەلەپوور ☰ ارث

**مەردەماڵ** / merdemał/: ☜ **مردەماڵ**

**مەردەمێر** / merdemêr/: ئاوەڵناو. جوامێر؛ ئازا و دلاوا ☰ جوانمرد

**مەردەن** / merden/: ☜ **مردن**

**مەردەنگی** / merdengî/: ناو. ١. لالە؛ شەمدانی بە شووشە ٢. کووپەڵەی شووشە ☰ ١. شمعدان ٢. خُم کوچک شیشەای

**مەردەنە** / merdene/: ☜ **مردن**

**مەردەوزیندە** / merde w zînde/: ناو. مەردەزیندە؛ مەردەزیننە؛ حەشارگەی بە پووش داپۆشراو ☰ کمینگاه با گیاه پوشیده

**مەردەی** / merdey/: چاوگ. مردن ☰ مُردن

**مەردی** / merdî/: ☜ **مەردایەتی**

**مەردیاق** / merd(i)yaq/: ناو. مرداق؛ مردیاق: ١. کاریتە و ئالودار ٢. مارتاک؛ ئالاش؛ پووش و چرۆی سەرمیچی خانوو ☰ ١. دیرک سقف ٢. انبیره

**مەردیشان** / merdîşan/: ناو. پەیژە؛ پەینجە؛ سلەم ☰ نردبام

**مەرز** / merz/: ناو. ١. سنوور؛ کەوشەن ٢. لێوارە؛ زێوار؛ قەراخ ٣. زەمینی داگیرکراو ٤. پوولی مفت ☰ ١. مرز ٢. لبە؛ کنارە ٣. زمین غصبی ۴. پول مُفت

**مەرزان** / merzan/: ☜ **مەزران**

**مەرزاندن** / merzandin/: ☜ **مەزراندن**

**مەرزنایرە** / merznayre/: چاوگ. دامەزراندن ☰ پایەگذاری کردن

**مەرزنایەرە** / merznayere/: چاوگ. دامەزراندن ☰ پی گذاشتن

**مەرزنجووش** / merzincûş/: ناو. گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ ☰ مرزنگوش

**مەرزنەرەی** / merznerey/: چاوگ. دامەزراندن ☰ پی گذاشتن؛ بنیاد نهادن

**مەرزوبۆ** / merz û bo/: ناو. ولات؛ سەرزەمینی جێگەی ژیان ☰ مرزوبوم

**مەرزە** / merze/: ناو. مەرسە؛ مەرزەک؛ فلفەلەک؛ گیایەکی گەلاوردی تیژی بۆنخۆشە وشک دەکرێ و دەخورێ ☰ مرزه

**مەرزەک** / merzek/: ☜ **مەرزە**

**مەرزەڵ** / merzeł/: ☜ **مەزار**

**مەرزەوان** / merzewan/: ناو. سنوورەوان؛ کەسێ کە کێشکی سنوور دەکێشێ ☰ مرزبان

**مەرزیایرە** / merzyayre/: چاوگ. دامەزران ☰ جاگیر شدن؛ استقرار یافتن

**مەرزیایەرە** / merzyayere/: چاوگ. دامەزران ☰ جاگیر شدن؛ مستقر شدن

**مەرزیەرەی** / merz(i)yerey/: چاوگ. دامەزران ☰ جاگیر شدن؛ قرار گرفتن

**مەرژوەل** / merjwel/: ☜ **مێرووله**

**مەرژی** / merjî/: ناو. مارجوو؛ مارژی؛ مەرجوو؛ مەرجی؛ میشەوش؛ مێژوی؛ مژوێ؛ نیسک

عدس

**مەرژیر** / merjîr/: ئاوەڵناو. ئاوارە؛ دەربەدەر؛ ڕەبەن آواره

**مەرس**[١] / mers/: ناو. ١. گـای بنـە لـە گێـرەدا ٢. کاری پشاوتن ١. گاو بنه ٢. عمل مُچاله کردن

**مەرس**[٢]: ئاوەڵناو. جاڕز؛ وەڕز عاصی

⊡ **مەرس کردن**: جاڕز کردن؛ وەڕز کردن عاصی کردن

**مەرست** / merist/: ئاوەڵناو. گومبوو؛ بێ‌سەر و شوێن گُم؛ بی‌نشان

**مەرسە** / merse/: ناو. گومان؛ خەیاڵ حدس

**مەرسەف** / mersef/: نـاو. قاوەسـینی؛ سـینی پچووک بۆ فینجانی قاوە و چای سینی کوچک

**مەرسەلا**[١] / mersela/: نـاو. ١. داسـتان؛ نەزیلـە؛ چیرۆک ٢. ڕووداو؛ قەوماو ١. داستان ٢. رویداد

**مەرسەلا**[٢]: ئامراز. لە گوێن؛ وەک همانند

**مەرسین** / mersîn/: چاوگ. پشاوتن مُچاله کردن

**مەرسیە** / mers(i)ye/: ناو. ١. کـاری لاوندنـەوەی مردوو بە بەند و باو ٢. شیعر یـا دەقـێ کـە لـەو بارەوە دەگوترێ ١و٢. مرثیه

**مەرش**[١] / merş/: نـاو. ١. ڕەشکەی کـا ٢. پـەلاس؛ بەڕەی دەزوو ١. تور کاهکشی ٢. گلیم نخی

**مەرش**[٢]: ☜ مەرشۆ

**مەرشاق** / merşaq/: نـاو. جانـەوەرێکی ئاوییـە لـە پشیلەیەکی قەڵەو دەچێ، کەوڵـی بەقیمەتـە پستانداری آبزی است

**مەرشک** / merşik/: ناو. جلەگا؛ پەلاسێ کە بە سەر پشتی گایدا ئەدەن جُل گاو

**مەرشۆ** / merşo/: ئاوەڵناو. مەرش؛ تـەپ؛ تەنبـەڵ؛ تەوەزەل؛ قوونگران تنبل

**مەرشە** / merşe/: ناو. بەلا؛ چۆرتم بلا

**مـەرغ** / merğ/: نـاو. گۆڕسـتان؛ قەورسـان گورستان

**مەرڤ** / meriv/: ☜ مرۆڤ

**مەرڤات** / mervat/: نـاو. قـەوم و قیلـە؛ مەرەڤـان؛ کەس‌وکار قوم و خویش

**مەرقان** / merqan/: ☜ مەرکان

**مەرقاندن** / merqandin/: ☜ مەرکاندن

**مەرقول** / merqûl/: ناو. عاج؛ ئاج؛ خیل؛ شەلفە عاج

**مەرکان** / merkan/: چاوگ. مـەرقان: ١. خـراپ بوون ٢. پیس بوون و لە کەڵـک کـەوتن (شـیر و هێلکـە) ١. خـراب شـدن ٢. فاسـد شـدن (شـیر و تخم‌مرغ)

**مەرکاندن** / merkandin/: چاوگ. مەرقانـدن: ١. خـراپ کـردن ٢. پـیس کـردنی هێلکــە و هەڵـگەڕاندنی شـیر ١. خـراپ کـردن ٢. فاسـد کردن (شیر و تخم‌مرغ)

**مەرکانە** / merkane/: ☜ مرکانە

**مەرکەف** / merkef/: نـاو. هـبر؛ ڕەنـگ بـۆ شـت نووسین مُرکب

**مەرکەنی** / merkenî/: ناو. جۆرێ گـۆزەی گـڵ نوعی کوزه گلی

**مـەرگ** / merg/: نـاو. ڕەوتی مـردن ‹نـەورۆز بـوو ئاگرێکی وەهای خسـتە جەرگـەوە/ لاوان بـە عەشـق ئەچوون بە بەرەو پـیری مەرگـەوە «پیرەمێـرد»›. مرگ

⊡ **مەرگی خوایی**: مەرگ بە هۆی پیر بوون یا کزی سروشتی لەشەوە مرگ طبیعی

**مەرگی کوتوپڕ**: مـەردگی بـە سـەکتە مـرگ مُفاجا

⊡ **مەرگ برین**: ١. کوشتن؛ مراندن ٢. */مەجاز/* باش پێکهێنانی کار ١. میراندن؛ کشـتن ٢. خـوب انجام دادن کار

**مەرگئاسا** / merg'asa/: ئاوەڵناو. ١. وەکوو مـەرگ ٢. */کینایە/* تووش؛ یەکجار دژوار ١. مرگ‌آسـا ٢.

بسیار دشوار

**مەرگوجێ** / merg û cê/: ☜ **مەرگوژی**

**مەرگوژی** / merg û jî/: ئاوەڵناو. مەرگوجێ: ١. لە مان و نەماندا ٢. بێسەروشوێن ⇐ ١. در حالت بین مرگ و زندگی ٢. مفقودالاثر

**مەرگۆنەک** / mergonek/: ناو. بانگوش؛ بانگلێر؛ باگردان؛ لۆغ ⇐ بامغلتان

**مەرگە** / merge/: ناو. ١. گەورە دینداری ئێزدی ٢. جێ لەوەڕ ⇐ ١. روحانی بزرگ ایزدیان ٢. چراگاه

**مەرگەسات** / mergesat/: ناو. کارەسات؛ گرگاشە؛ کارەڕەهات؛ کار و ڕەهات ⇐ فاجعە؛ رویداد ناگوار

**مەرگەسەری** / mergeserî/: ناو. کوێرەوەری؛ چەرمەسەرێ ⇐ بدبختی

**مەرگەماسی** / mergemasî/: ناو. ژار ماسی ⇐ گیاه زهرماهی

**مەرگەمووش** / mergemûş/: ناو. مەڕەمووش؛ دەرمانێکە مشکی پێ دەکوژن ⇐ مرگموش

**مەرگەمەلە** / mergemele/: ناو. *[پەلار]* پەلەقاژەی نێو ئاو ⇐ عمل دست و پا زدن در آب

**مەرگیراڤەر** / mergîra'aver/: ئاوەڵکار. زۆر بەپەلە؛ گەلەکی بلەز ⇐ با شتاب

**مەرمەریشۆک** / mermerîşok/: ☜ **مارمێلکە**

**مەرمەند** / mermend/: ناو. گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ ⇐ گیاهی دارویی

**مەرمی** / mermî/: ناو. ١. مزا؛ قورقوشم ٢. گوللە؛ تیر؛ تەنێکی خڕیلەی کانزایی لە نووکی فیشەکدا ⇐ ١. سُرب ٢. گلولە؛ مَرمی

**مەرن** / merin/: ناو. ١. مێرگ؛ چیمەن ٢. زەلکاو؛ زۆنگ ⇐ ١. مرغزار ٢. باتلاق

**مەرو** / mer(i)w/: ناو. گۆزە ⇐ سبو

**مەرواڵە** / merwałe/: ☜ **نوسەکە**

**مەروە** / merwe/: ☜ **هەرمێ**

**مەروێ** / merwê/: ☜ **هەرمێ**

**مەرۆ** / mero/: ئاوەڵناو. بێبرەو؛ کەساد؛ ناڕەواج ⇐ کساد

**مەرۆڤ** / merov/: ☜ **مرۆڤ**

**مەروو** / merû/: ☜ **مرۆڤ**

**مەرووز** / merûz/: ئاوەڵناو. کز و لاواز ⇐ نحیف

**مەرە** / mere/: ناو. ١. حاڵ؛ چلۆنایەتی ٢. مەرەد؛ دەردیسەری؛ گرفتاری ⇐ ١. حال؛ وضع ٢. گرفتاری

**مەرەتەست** / meretest/: ناو. جۆرێ ماسی ⇐ نوعی ماهی

**مەرەخان** / merexan/: ☜ **ماڵەغان**

**مەرەخەس** / merexes/: ئاوەڵناو. مەرەخەست: ١. ئیجازەدراو؛ ڕێگەدراو بۆ ئەنجامی کارێ ٢. *[کینایە]* بێمێشک؛ بێعەقڵ؛ گەوج ⇐ ١. مُجاز ٢. ابله

**مەرەخەست** / merexest/: ☜ **مەرەخەس**

**مەرەخەستی** / merexestî/: ☜ **مەرەخەسی**

**مەرەخەسی** / merexesî/: ناو. مەرەخەستی؛ بەردایی؛ بەرایی ⇐ مُرخصی

**مەرەد** / mered/: ناو. مەرە: ١. حاڵ؛ بار «خەریک بوو منیش بترسێنێ و بە مەرەدی خۆی بەرێ «هێمن»» ٢. دەردیسەری؛ گرفتاری ⇐ ١. وضع؛ چگونگی ٢. گرفتاری

⊡ **بە مەرەدی کەسێ/ شتێ چوون**: وەکوو کەس/ شتێ بە سەردا هاتن «... ئەمانە ڕاست بە مەرەدی کەسانێ چوون، کە خەریکی پێکردنی ئاگریک بوون ... «هەژار، *قورئان*»» ⇐ در وضعیت مشابە با کس/ چیزی قرار گرفتن

**مەرەز** / merez/: ناو. ١. مووی نەرمی بە مۆنجی جۆرێ بزن کە دەکرێ بە بووزوو ٢. نەخۆشی و کزی ٣. ☜ **مەرەس** ⇐ ١. کُرک نوعی بُز ٢. بیماری ٣. ☜ **مەرەس**

**مەرەزار** / merezar/: ئاوەڵناو. ١. کز؛ لەجەر؛ لاواز؛ دالگۆشت ٢. نەخۆش ⇐ ١. لاغر ٢. بیمار

**مەڕەزاری / merezarî/:** ناو. لەجەری؛ لاوازی 🇮🇷 لاغری

**مەڕەزن / merezin/:** ناو. نەخۆشین 🇮🇷 بیماری

**مەڕەزە / mereze/:** ناو. چەڵتووکجاڕ؛ برنجەجاڕ 🇮🇷 شالیزار

**مەڕەزەوان / merezewan/:** ناو. ئاگاداری چەڵتووکجاڕ 🇮🇷 نگهبان شالیزار

**مەڕەس / meres/:** ناو. مەڕەز؛ پەتی ملی تاژی ‹پەت لە مل بی و ڕاتبکێشن هەر وەکوو تانجی و مەڕەس/ نامەوێ ئەو جۆرە ژینە، دەک خوا نەیدا بە کەس «قانع»› 🇮🇷 طناب گردن تازی

**مەڕەشە / mereşe/:** ناو. مێشوولە؛ تۆفانە؛ پەخشە 🇮🇷 پشه

**مەڕەڤ / merev/:** ناو. خزم؛ قەوم 🇮🇷 خویشاوند

**مەڕەڤان / merevan/:** ناو. مەرڤات؛ قەوم و قیلە؛ کەس‌وکار 🇮🇷 قوم و خویش

**مەڕەق / mereq/:** ☜ مەراق

**مەڕەقەنەی / mereqeney/:** ناو. ١. جێگۆڕکێ؛ کار و ڕەوتی گۆزانەوە ٢. کاری خۆڵ بە سەر یەکا تۆپەڵ کردن 🇮🇷 ١. نقل‌مکان ٢. عمل بر هم انباشتن خاک

**مەڕەک / merek/:** ناو. لەوەڕدان؛ تفاقدان؛ جێگەی کا و گزرە 🇮🇷 کاهدان

**مەڕەکەب / merekeb/:** ☜ مەرەکەف

**مەڕەکەبدان / merekebdan/:** ☜ مەرەکەفدان

**مەڕەکەف / merekef/:** ناو. مەرەکەب؛ مەرەکەو؛ تراوێ کە قەڵەمی تێدا ڕەنگ دەکەن و بە سەر قاقەزیدا دێنن 🇮🇷 مُرکب

**مەڕەکەفدان / merekefdan/:** ناو. مەرەکەبدان؛ وورنقیسدان؛ دەوات؛ دوێت؛ حۆقە 🇮🇷 مُرکب‌دان

**مەڕەکەفمژ / merekefmij/:** ناو. زوهانگ؛ زوانگ 🇮🇷 کاغذ خشک‌کن

**مەڕەکەو / merekew/:** ☜ مەرەکەف

**مەرەم[1] / merem/:** ☜ مەرام

**مەرەم[2]:** ☜ مەحرەم

**مەرەندی / merendî/:** ناو. جۆرێ گندۆرە 🇮🇷 نوعی خربُزه

**مەرەنگۆز / merengoz/:** ناو. دارتاش؛ نەجاڕ 🇮🇷 نجّار

**مەرەنگۆزی / merengozî/:** ناو. دارتاشی؛ نەجاڕی 🇮🇷 نجّاری

**مەرهەم / merhem/:** ☜ مەڵهەم

**مەری / merî/:** ☜ مرۆڤ

**مەریژ / merîj/:** ☜ مێرووله

**مەریسۆک / merîsok/:** ناو. گۆزروان؛ گاوەزوان؛ گیای مژمژە 🇮🇷 گاوزبان

**مەریکانە / merîkane/:** ناو. گەزووز؛ مۆرانە؛ مۆرانە 🇮🇷 موریانه

**مەریەم / meryem/:** ناو. مریەم؛ پەلەوشە: ١. گیایەکی ئالیکی لە تیرەی نێرگزە، بە گوڵی ناوەناوەی باریک و درێژ و لووس و نووکتیژەوە ٢. گوڵەپووران؛ گوڵەداماگ؛ گوڵی سپی و هێشوویی و بۆنخۆشی ئەو گیایە 🇮🇷 ١و٢. مریم

**مەرێس / merês/:** ناو. ١. بریقە ٢. جوانی و خوشیکی ٣. ڕەنگ‌وڕوو 🇮🇷 ١. درخشش ٢. زیبایی ٣. رنگ‌ورو

**مەڕ / meř/:** ناو. ١. مە؛ مەیشنا؛ میک؛ مینگا؛ میەر؛ مێ؛ مێشن؛ مێشنا؛ مێه؛ مەه؛ مەها؛ پەز؛ پێز؛ پەس؛ پەزمامی؛ شەکمەڕ؛ مەڕەزاو؛ مەڕزاو؛ میه ؛ مهی؛ مهێ؛ میهی؛ مەی؛ مێیە؛ مییە؛ گەورگ؛ کوڕ؛ گیانەوەری گوانداری کاوێژکەر، لە دوو جۆری کێوی و کەوی کە بۆ شیر، گۆشت، کەوڵ و پەشمەکەی ڕایدەگرن و دایدەبەستن ٢. پێمەڕە؛ بێلی ئاسن ٣. زاخە؛ کوول ٤. ئەشکەوت؛ غار 🇮🇷 ١. گوسفند ٢. بیل آهنی ٣. زاغه ٤. غار

▣ **مەڕی تۆیانە:** مەڕ یا کاوڕێ کە ڕۆژی گواستنەوەی بووک بۆ ماڵی زاوای ئەنێرن ☰ گوسفند هدیەی عروسی

◘ **مەڕ کەردش:** بە پێمەڕە کار کردن ☰ بیل زدن

**مەڕاڵ / meřał/:** ناو. ئاسک؛ پەزەکێفی ‹دێن و دەچن بە دوند و قەدی زەرد و ماهەوە/ گاکێوی تاق و جووت و بەگەل مێگەلی مەڕاڵ «حەقیقی»› ☰ مارال

**مەڕان / meřan/:** ناو. پنجکێکە لە لێڕەوار گەڵای لە گەڵاتوو دەکا و بەرێکی وردی ڕەش دەگرێ ☰ درختچەای جنگلی

**مەڕانە / meřane/:** ناو. ١. پووشانە؛ سەرانەی ئاژەڵ ٢. جۆرێ داس ☰ ١. سرانەی گلە ٢. نوعی داس

**مەڕبەند / meřbend/:** ناو. سەنگ و زنجیر بۆ بەستنەوەی یەکسم ☰ میخ و زنجیر پابند ستور

**مەڕبێر / meřbêr/:** ناو. ١. ☜ مەڕبێرە ٢. پێمەڕەی گەورە ☰ ١. ☜ مەڕبێرە ٢. بیل آهنی بزرگ

**مەڕبێرە / meřbêre/:** ناو. مەڕبێر؛ بێرەمەڕ؛ دەمی دۆشینی ڕانەمەڕ ☰ هنگام دوشیدن گلە

**مەڕت / meřt/:** ناو. ١. بەڕە؛ پەلاس ٢. ڕووش؛ شوێن لە نینۆک یان لە تیخ ☰ ١. گلیم ٢. خراش

**مەڕتان / meřtan/:** چاوگ. ڕووشان؛ داڕووشان ☰ خراشیدن

**مەڕتاندن / meřtandin/:** چاوگ. مەرتاندن: ١. ڕووشاندن ٢. کەوڵ کردن؛ پێست لێ داماڵین (ئاژەڵ) ☰ ١. خراشیدن ٢. پوست کندن (دام)

**مەڕتاو / meřtaw/:** ئاوەڵناو. ڕووشاو؛ ڕووکاو ☰ خراشیدە

**مەڕتاوی / meřtawî/:** ئاوەڵناو. ڕووشاوی؛ ڕووکاوی ☰ خراش

**مەڕتەبە / meřtebe/:** ناو. ١. جار؛ کەڕەت ٢. نهۆم؛ تەبەقە ٣. پلە و پایە ☰ ١. بار؛ مرتبە ٢. اشکوبە؛ طبقە ٣. پایە؛ مرتبە

**مەڕچ / meřç/:** ئاوەڵناو. پلیخاو؛ دەبەر پێدا پلیشاو ☰ لە؛ لوردە

**مەڕچاندن / meřçandin/:** چاوگ. پلیخاندنەوە؛ تلێقاندنەوە ☰ لە کردن

**مەڕچی / meřçî/:** ئاوەڵناو. پلیخاو؛ پلیشاو ☰ لەشدە

**مەڕچین / meřçîn/:** چاوگ. پلیخانەوە؛ تلێقیاوە ☰ لە شدن

**مەڕخێفە / meřxêfe/:** ناو. نۆبەر؛ نۆبەرە ☰ نوبر

**مەڕدا / meřda/:** ناو. کرێکار؛ کارگەر؛ کاریگەر ☰ کارگر

**مەڕدار / meřdar/:** ناو. ١. کەسێ کە ئاژەڵی وردەی زۆرە ٢. کرێکاری قوڕەکاری کە پێمەڕە دەکار دێنێ ☰ ١. گلەدار ٢. کارگر بیل‌زن

**مەڕداری / meřdarî/:** ناو. تەرشداری؛ ئاژەڵداری ☰ دامداری

**مەڕدۆش / meřdoş/:** ناو. ١. سەتڵ؛ پەقرەج ٢. بێری؛ کەسێ کە مەڕ دەدۆشێ ☰ ١. سطل شیردوشی ٢. آنکە گوسفند می‌دوشد

**مەڕزاو / meřzaw/:** ☜ مەڕەزاو

**مەڕژ / meřj/:** ناو. گوڕە؛ نەعرەتە ☰ غُرّش

**مەڕژین / meřjîn/:** چاوگ. نەڕاندن؛ گوڕاندن ☰ غُرّیدن

**مەڕک / meřk/:** ناو. مەڕ؛ پێمەڕ؛ بێلاسن ☰ بیل

**مەڕکانە / meřkane/:** ناو. ١. شاکاسی ٢. کووپەڵەی دەم‌گوشاد ☰ ١. شەکاسە ٢. خُمچەی دهن‌گشاد

**مەڕگ / meřg/:** ناو. بێڵ؛ مەڕە؛ مەڕک؛ پێمەڕە ☰ بیل

**مەڕگە / meřge/:** ناو. خۆرش؛ خۆرشت؛ ترشک؛ هەر یەکە لە پێخۆرگەلی لێنراوی کەم یا زۆر ئاودار کە زۆرتر دەگەڵ پلاو دەخورێ ☰ خورش

**مەڕمەڕ / meřmeř/:** ناو. ١. جۆرێ بەردی

ئاهەکییە، لە ژێر تەوژمی زۆردا وەک بلـۆری لـێ هاتووە. زۆر جوانە و بۆ پەیکەرتاشـی و ڕووکـاری مـالان بـەکار دێ ٢. کـەلا؛ هەلـمات؛ کـۆی چکۆلەی لە شیشە، سوالەت و ... زیاتر بۆ کایەی منالان 🇮🇷 ١. سنگ مرمر ٢. تیله

**مەڕمەڕش** / meřmeřiş/: ناو. شاخبێزی؛ شاخبزی؛ مەرمەڕشا؛ مـۆری؛ پارچەیـەکی سـپی، ناسـک و سفتچنە 🇮🇷 چلوار

**مەڕمەڕشا** / meřmeřşa/: ناو. خامی هەرەسپی کـە دەکرێتە کراس پیاوانە 🇮🇷 ململ

**مەڕمەڕۆکێ** / meřmeřokê/: ☜ **مێشێن**

**مەڕمەڕێن** / meřmeřên/: ☜ **مێشێن**

**مەڕنەکەنـە** / meřnekene/: نـاو. مـەڕدار؛ کەسـێ کاری هەر مەڕداریە 🇮🇷 گوسفندار

**مـەڕنەمووکـە** / meřnemûke/: ناوەلـناو. [کنایـە] مەڕەمووکە؛ لاوازی بێهێز و توان 🇮🇷 لاغرمُردنی

**مەڕوماڵات** / meř û małat/: نـاو. ماڵیات؛ مالات 🇮🇷 دام

**مەڕە** / meře/: ناو. ١. شکێڕ؛ قەلشەبەردی گـەورە لـە چیـای بـەردین ٢. مێشـەنگوینی هێشـتا هەنگوین ساز نەکردوو ٣. پێمـەڕە؛ بـێل ٤. ☜ **مشک-١** 🇮🇷 ١. شـکاف کـوه سـنگی ٢. زنبـور هنـوز عسل ننهاده ٣. بیل آهنی ۴. ☜ **مشک-١**

**مەڕەبێرە** / meřebêre/: ناو. ڕانەبێرە؛ کـار و ڕەوتی هێنانەوەی مەڕ کاتی نیوەڕۆ بۆ دۆشین 🇮🇷 آوردن گله هنگام ظهر برای دوشیدن

**مەڕەخیڤە** / meřexîve/: ناو. نۆبەرە 🇮🇷 نوبر

**مەڕەزاو** / meřezaw/: ناو. مـەڕزاو؛ مـەڕ؛ میـک 🇮🇷 گوسفند

**مەڕەسوور** / meřesûr/: ☜ **مەڕەکێوی**

**مەڕەکێوی** / meřekêwî/: نـاو. مەڕەسـوور؛ مـەڕی؛ پەزەکێفی؛ پەزی کێوی 🇮🇷 گوسفند کوهی

**مەڕەگ** / meřeg/: ناو. عەنباری گەورەی بازرگـانی 🇮🇷 انبار بزرگ کالای تجاری

**مەڕەمووش** / meřemûş/: ☜ **مەڕگەمووش**

**مەڕەمووکە** / meřemûke/: ☜ **مەڕنەمووکە**

**مەڕی** / meřî/: نـاو. ١. ☜ **مەڕەکێـوی** ٢. جـۆرێ ڕەوتی ئەسپ، وەک یۆرغە ٣. چاوی کاڵ؛ ڕەنگی زەردی ئاماڵ شین بۆ چاو 🇮🇷 ١. ☜ **مـەڕەکێـوی** ٢. حالتی شبیه یورتمه ٣. چشم زاغی

**مـەڕیـای** / meřyay/: چـاوگ. شـکان؛ شـکیان 🇮🇷 شکستن

**مەزا** / meza/: ئاوەلـناو. نەزۆک؛ تایبەتمەندی مایێ کە زگ ناکا 🇮🇷 نازا

**مەزات** / mezat/: ☜ **مەزاد**

**مەزاتخانە** / mezatxane/: ناو. حەڕاجەبازار 🇮🇷 بازار حراج

**مەزاج** / mezac/: نـاو. خـوو؛ مگێـز؛ مـزاج 🇮🇷 خـو؛ عادت

**مەزاخ** / mezax/: ناو. خـەرج؛ بـەخت؛ سـەرف 🇮🇷 خرج

**مـەزاختن** / mezaxtin/: چـاوگ. خـەرج کـردن؛ بەخت کردن 🇮🇷 خرج کردن

**مـەزاد** / mezad/: نـاو. مـەزات؛ حـەڕاج؛ هـەڕاج؛ فرۆشی شتێک بە فرەترین نرخی پێشنیارکراو لە لایەن کڕیارانـەوە ‹مـەزاد، مـەزاد، هـەرچیم هەیـە هەمووی مـەزاد/ بـە پارچەیـەک پـەڕۆی سـادە کـە هەڵبکرێ و بشـنێتەوە/ لـە سـەر بسـتێ زەوی ئـازاد «پەشێو»› 🇮🇷 حراج

**مەزار** / mezar/: ناو. مـەرزەڵ؛ مـەزەڵ؛ زیارەتـان ‹گەردئالوودەن دەور مەزار لەیلێ/ ئاوپاشی و مـالاش لازمەن خەیلێ «مەولەوی»› 🇮🇷 مزار

**مەزارگـە** / mezarge/: نـاو. زیارەتـان؛ گۆڕسـان؛ قەبران 🇮🇷 گورستان

**مەزاق** / mezaq/: ناو. ١. حەنەک؛ گاڵـتە؛ شـۆخی ٢. ئیشتیا؛ چێژە ٣. تیتـاڵ؛ تیـز 🇮🇷 ١. شـوخی ٢.

ذوق ۳. مسخرگی

⊡ **مەزاق پێ کردن:** گاڵتە پێ کردن ☰ مسخره کردن

**مەزاڵ** / mezal/: ناو. دەرفەت؛ هەل؛ کێس؛ کەیس ☰ فُرصت؛ مجال

**مەزان** / mezan/: ئامراز. تۆ مەڵێ؛ مەمنا؛ تمەز؛ تومەز؛ تومەس مەکە ☰ تو نگو؛ نگو که

**مەزبووت** / mezbût/: ئاوەڵناو. چوست؛ چالاک ☰ چالاک

**مەزخ** / mezx/: ناو. مەزێخ: ۱. خەرج ۲. چۆنیەتی بەتلانی ماڵ ☰ ۱. خرج ۲. چگونگی از بین رفتن مال

**مەزخاندن** / mezxandin/: چاوگ. ۱. خەرج کردن ۲. بەتلاندنی ماڵ ۳. گوزەراندن ☰ ۱. خرج کردن ۲. هدر دادن مال ۳. گُذراندن

**مەزد**[1] / mezd/: ناو. کولانکە؛ کولاوڕۆژنە؛ بانجە ☰ روزنەی بام

**مەزد**[2]: ئاوەڵناو. مەزن؛ گەورە ☰ بزرگ

**ـ مەزد**[3]: پاشەوشە. مەزن؛ گەورە ‹سەرمەزد› ☰ بزرگ

**مەزدا** / mezda/: ناو. خودای ئایینە ئێرانییەکان ☰ مزدا

**مەزرا** / mezra/: ناو. مەزرە؛ کێڵگە؛ مووچە؛ جێگەی شت لێ چاندن ☰ مزرعه

**مەزران** / mezran/: چاوگ. مەرزان؛ دامەزران: ۱. لە جێگەیەک مانەوە ۲. گیرسانەوە؛ جێگیر بوون ☰ ۱. سُکنی گزیدن ۲. مُستقر شدن

**مەزراندن** / mezrandin/: چاوگ. مەرزاندن؛ دامەزراندن؛ سەقامگیر کردن ☰ مُستقر کردن

**مەزرکە** / mezirke/: ناو. ۱. ☜ **مەزرەکە ـ۲** ۲. قۆلپێچی نانکەر ☰ ۱. ☜ **مەزرەکە ـ۲** ۲. بازوپیچ نانوا

**مەزرنایەرە** / mezirnayere/: چاوگ. دامەزراندن ☰ سُکنی دادن

**مەزرۆکە** / mezroke/: ☜ **مەزرەکە ـ۲و۳**

**مەزرە** / mezre/: ☜ **مەزرا**

**مەزرەق** / mezreq/: ☜ **مزراق**

**مەزرەقە** / mezreqe/: ناو. ۱. ئامرازێکە لە ئاسیاودا ۲. ☜ **مەزرەکە ـ۲** ☰ ۱. ابزاری در آسیاب ۲. ☜ **مەزرەکە ـ۲**

**مەزرەکە** / mezreke/: ناو. مەزکەرە: ۱. چاپخانە؛ جێگەی چاپ کردنی نووسراو ۲. مەزرکە؛ مەزرۆکە؛ مەزرەقە؛ ڕفێدە ۳. مەزرۆکە؛ داری نووک تێژ کە نانی لە تەندوور پێ دەردێنن ☰ ۱. چاپخانه ۲. بالشتک نانوا ۳. چوبی که با آن نان را از تنور در می‌آورند

**مەزرەکەدار** / mezrekedar/: ناو. چاپخانەدار؛ خاوەن چاپخانە ☰ چاپخانه‌دار

**مەزریایەرە** / meziryayere/: چاوگ. دامەزران ☰ سُکنی گزیدن

**مەزرینگە** / mezrînge/: ناو. ئیدارە؛ دام و دەزگای کارگێڕی ☰ اداره

**مەزرێخ** / mezrêĥ/: ☜ **مزراق**

**مەزفک** / mezfik/: ☜ **میزەفك**

**مەزکەرە** / mezkere/: ☜ **مەزرەکە**

**مەزگ** / mezg/: ☜ **مێشك ـ۱**

**مەزگت** / mezgit/: ☜ **مزگەوت**

**مەزگدار** / mezgdar/: ئاوەڵناو. ۱. خاوەن مژگ ۲. [کینایە] زانا ☰ ۱. مغزدار ۲. دانا

**مەزلاق** / melaq/: ناو. گیایەکە بنەکەی بە چێشت لێ دەنێن ☰ گیاهی است

**مەزڵووم** / mezłûm/: ئاوەڵناو. دەشەنی؛ ناهەقی لێکراو ☰ مظلوم

**مەزن**[1] / mezin/: ناو. مازان؛ مازن؛ مەزند؛ سەرۆک؛ ڕەئیس ‹حەسەناغای حاجۆ ـ کە مەزنی عاشیرەت بوو ـ بە جحێڵی تەنبوورژەنێکی زانا بووە «هەژار،

چێشتی مجنور» ☰ رئیس

**مەزن**[٢]: ئاوەڵناو. مازان؛ مازن؛ مەزند؛ گەورە ‹لەم نەقشەیەدا، کاکی مەزن، پیادەیی شا بوو/ لافی مەزنی و گەورەیی ئەو هەر وەکوو با بوو! «هەردی»› ☰ بُزُرگ

**مەزناندن / meznandin/**: چاوگ. مەزن کردن ☰ بزرگ داشتن

**مەزنانمەزنتر / meznan mezintir/**: ناو. خودا؛ خودێ؛ خوا ☰ عنوانی برای خدا

**مەزناهی / meznahî/**: ناو. ١. ☜ مەزنایەتی ٢. سەرۆکی ☰ ١. ☜ مەزنایەتی ٢. ریاست

**مەزنایەتی / meznayetî/**: ناو. مەزناهی؛ گەورەیی ☰ بزرگی

**مەزند / mezind/**: ☜ مەزن

**مەزندە / mezinde/**: ☜ مەزەننە

**مەزندەکار / mezindekar/**: ناو. خەملخەر ☰ تخمین‌زن

**مەزننە / mezinne/**: ☜ مەزەننە

**مەزنی / mez(i)nî/**: ناو. مەزنایەتی؛ گەورەیی ☰ بزرگی؛ عظمت

**مەزووکە / mezûke/**: ☜ مارمێلکە

**مەزە / meze/**: ناو. ١. تام؛ چێژە ٢. خواردنێ کە دەگەڵ شەراب دەخورێ ٣. ئیشتیا ٤. کرمێکی سپییە لە ناو مالان دەبیندرێ ☰ ١. مزە؛ طعم ٢. مزەی شراب ٣. اشتها ۴. کرمی سفیدرنگ

▣ **مەزە بزووتن**: ئیشتیا کردن؛ ئازەزوو کردن ☰ آرزو کردن

**مەزە پێ دان**: مەزە دان؛ خوێ لە چێشت کردن یان ترش کردن ☰ مزە دادن بە غذا

**مەزە دان**: ١. ☜ مەزە پێ دان ٢. تام دان؛ خۆش بوون ‹بەلالەکەمان برژان، فرە مەزەی دا› ☰ ١. ☜ مەزە پێدان ٢. مزە دادن

**مەزەب / mezeb/**: ☜ مەزهەب

**مەزەبزوێن / mezebizwên/**: ئاوەڵناو. ئیشتیاهێن؛ ئازەزوو بزوێن ☰ اشتهاآور

**مەزەدار / mezedar/**: ئاوەڵناو. ١. خۆش‌چێژە ٢. [کینایە] جوانی زۆر جوان ‹شەدەلار! هەی مەزەدار! خانمەکەی بانە! «گۆرانی»› ☰ ١. خوشمزە ٢. بسیار زیبا

**مەزەڵ / mezeł/**: ناو. ١. ☜ مەزار ٢. نهۆم؛ قات ☰ ١. ☜ مەزار ٢. طبقە؛ اشکوبە

**مەزەندە / mezende/**: ☜ مەزەننە

**مەزەننە / mezenne/**: ناو. مەزندە؛ مەزننە؛ مەزەندە: ١. قیمەت؛ بایی ‹مەزەننەی ماڵ لێرە چۆنە؟› ٢. گومان؛ شک ☰ ١. مظنّە؛ نرخ ٢. حدس؛ گمان

**مەزەو / mezew/**: ☜ مەزهەب

**مەزهەب / mezheb/**: ناو. مەزەب؛ مەزەو؛ مەسەب؛ مەسەو؛ ئایین؛ دیژە؛ کۆمەڵە ئامۆژەگەلێکی دینی کە تەنیا پەسندی تاقمێ لە شوێنکەوتوانی ئەو دینەیە ☰ مذهب

**مەزیخ / mezîx/**: ناو. سەرف؛ خەرج؛ بەخت ☰ خرج

**مەزێخ / mezêx/**: ☜ مەزخ

**مەژبوور / mejbûr/**: ☜ مەجبوور

**مەژدە / mejde/**: ☜ مەجیدی ـ٢

**مەژرفە / mejirfe/**: ناو. پاروو؛ بێلی دارین ☰ پارو

**مەژک / mejk/**: ☜ مێشك ـ١

**مەژگ / mejg/**: ☜ مێشك ـ١

**مەژگلە / mejg(i)łe/**: ناو. گیایەکە دەخورێ ☰ گیاهی خوردنی

**مەژگورە / mejgure/**: ناو. بڕبڕاگە؛ مۆرەغە ☰ ستون فقرات

**مەژگوڕە / mejguře/**: ناو. بڕبڕە؛ بڕبڕاگە ☰ ستون فقرات

**مەژگە / mejge/**: ناو. کاکڵی گوێز ☰ مغز گردو

**مەژمە** / mejme/: ☜ **مەجومعە**

**مەژودار** / mejudar/: ئاوەڵناو. بەئاوەز؛ ژیر ☰ خردمند

**مەژولانک** / mejulank/: ناو. برژانگ ☰ مُژه

**مەژو** / mejo/: ☜ **مێشك ـ١**

**مەژوو** / mejû/: ☜ **مێشك ـ١**

⊡ **مەژو چەلقیان:** [کینایە] مێشک شڵەقیان؛ عەقل نەمان ☰ خُل شدن

**مەژی** / mejî/: ☜ **مێشك ـ١**

**مەژیچک** / mejîçik/: ناو. پێشەیەک کە مێشکی تیایە و دایئەتەکنن و ئەیمژن ☰ استخوان حاوی مغز

**مەژیدە** / mejîde/: ☜ **مەجیدی ـ٢**

**مەژیر** / mejîr/: ئاوەڵناو. کۆچەر؛ ڕەبەن ☰ مُهاجر

**مەس**[1] / mes/: ☜ **مس**[1]**ـ١**

**مەس**[2]: ئاوەڵناو. ١. مەست؛ لوول؛ گیز؛ سەرخۆش ٢. مەزن؛ گەورە ٣. قەڵەو؛ گۆشتن ☰ ١. مست ٢. بزرگ ٣. چاق

⊡ **مەس بون:** ☜ **مەست بون**

**مەس کرن/ کردن:** ☜ **مەست کردن**

**مەساج** / mesac/: ☜ **ماساژ**

**مەساحە** / mesaĥe/: ناو. خەتکوورەوکەر؛ میدادسڕ؛ کەرستەیەک لە جنسی جۆرێ لاستیک بۆ سڕین و کوژاندنەوەی شوێنی میداد ☰ مدادپاک‌کن

**مەساسک** / mesasik/: ناو. لابیتە؛ لاپیتە؛ لاویتە ☰ چوبدست شخم‌زن

**مەساسە** / mesase/: ناو. مساس؛ مساسک؛ مساسە؛ میساسە؛ میساس؛ دار دەستی جووتیار کە سەرێکی کلکەبزمار و سەرێکی پیشکانی تێدایە ☰ چوبدست شخم‌زن

**مەسانە**[1] / mesane/: ناو. مێزدان؛ گمێزدان ☰ مثانه

**مەسانە**[2]: ☜ **مەستانە**

**مەساه** / mesah/: ناو. ١. سندووق؛ یەغان ٢. هۆڕ؛ جەوالی مەزن ☰ ١. صندوق ٢. جوال بزرگ

**مەساهە** / mesahe/: ناو. سندووق؛ سنۆق؛ چەکمەزە ☰ صندوق

**مەست**[1] / mest/: ناو. ١. پاڵای لە هەمانە کە نوێژی پێوە ئەکەن ٢. بەیانی؛ سبەی؛ سۆزی؛ شەوسۆ ☰ ١. نوعی پاپوش ٢. فردا

**مەست**[2]: ئاوەڵناو. ١. مەس؛ گیز؛ لوول؛ سەرخۆش ٢. [کینایە] غللوور؛ لەخۆبایی ٣. تێر؛ مڕ ٤. ڕاست و بێ‌گرێ ٥. مشت‌وماڵ‌دراو ٦. تەمەڵ؛ تەوەزەل ٧. سڕ؛ تەزیو ٨. ماندوو؛ مانگ؛ شەکەت ☰ ١. مست ٢. مغرور ٣. سیر (از خوراک) ۴. راست و مستقیم ۵. صیقل‌زده ۶. تنبل ۷. بی‌حس ۸. خسته

⊡ **مەستی مەست:** ڕەشەمەست ☰ پاتیل

⊡ **مەست بون:** مەس بوون؛ سەرخۆش بوون ☰ مست شدن

**مەست کردن:** مەس کرن/ کردن؛ خۆ سەرخۆش کردن ☰ مست کردن

**مەستی شتێ بون:** تەواو لە بەر یان لە نێو شتێکی خۆشدا بوون ‹مەستی خەو بووم هاتنە سەرم!› ☰ مست چیزی بودن

**مەست**[3]: ئاوەڵکار. سۆزی؛ بەیانی ☰ فردا

**مەستانە**[1] / mestane/: ناو. مەسانە؛ وەک سەرخۆشان ‹قاقای مەستانە، قسەی سووک، گفتی چرووک «هەژار»› ☰ مستانه

**مەستانە**[2]: ئاوەڵکار. مەسانە؛ وەکوو مەست ‹مەستانە دەڕۆیشت و ڕادەوەستاوە› ☰ مستانه

**مەستاو** / mestaw/: ئاوەڵناو. پاراو؛ تێراو ☰ سیراب

**مەستور** / mestûr/: ئاوەڵناو. ١. مەحجووب؛ بە شەرم و حەیا ٢. مەس؛ مەست ☰ ١. دارای شرم و حیا ٢. مست

**مەستە** / meste/: ناو. بەیانی؛ سۆزی؛ سبەی؛

سبەینێ ☰ فردا

**مەستەبیرۆ** / mestebîro/: ناو. مەستەبێرۆ؛ مەشتەبێرۆ؛ دووسبەی؛ دووسۆ ☰ پس‌فردا

**مەستەبێرۆ** / mestebêřo/: ☜ مەستەبێرۆ

**مەستەر** / mester/: ناو. خزمەتکاری بەردەست؛ نۆکەری بەردەستان ☰ نوکر

**مەستەراح** / mesteraĥ/: ناو. مەستەراو؛ مستەراو؛ ئاودەست؛ سەراو ☰ مُستراح

**مەستەراو** / mesteraw/: ☜ مەستەراح

**مەستەڕە** / mesteře/: ناو. هێڵینگ؛ زاغور؛ ڕاستە؛ خەتکێش؛ خەتکەش؛ کڕکەش؛ ئامرازێکی تەخت و باریک لە چێو، لاستیک یان کانزا، بۆ کێشانی هێڵی ڕێک و پێوانی درێژایی هێڵێک ☰ خط‌کش

**مەستەکی** / mestekî/: ناو. ١. مەسکی؛ مەسەکی؛ دەوەنێکە شیرەی لێ دەگرن وەک جاچکە ئەیجاون بۆنی خۆشە ٢. جیوە و شیرەی داری کاژ ☰ ١. بوتەی مصطکی ٢. نوعی انگُم

**مەستی** / mestî/: ناو. ١. مەسی؛ سەرخۆشی ٢. جۆرێک پێڵاوی پیاوانە ☰ ١. مستی ٢. نوعی کفش مردانە

**مەسحەف** / mesĥef/: ☜ مسحەف

**مەسخ** / mesx/: ناو. چۆنیەتی شکڵ گۆڕان؛ بیچم ناشیرین بوون ☰ مسخ

**مەسدەر** / mesder/: ناو. چاوگە؛ چاوگ ☰ مصدر

**مەسرەت** / mesret/: ☜ مەسڵەت

**مەسرەف** / mesref/: ناو. خەرج؛ مزەخت ‹ئەم مانگە مەسرەفمان زۆر بووە، دەبێ زیاتر دەستی پێوە بگرین› ☰ خرج

**مەسقەتی** / mesqetî/: ☜ مەشکەفی

**مەسقەفی** / mesqefî/: ☜ مەشکەفی

**مەسقەڵ** / mesqeł/: ناو. ئامرازی خۆ جوان کردن و تاس و لووس‌دان ☰ ابزار آرایش و بزک کردن

**مەسکە** / meske/: ناو. خێگە؛ هیزە ☰ خیگ

**مەسکەت** / mesket/: ناو. شیرینییەکە لە ئارد و کاکلەگوێز و شەکر دەکرێ ☰ نوعی شیرینی

**مەسکەر**[١] / mesker/: ☜ مسگەر

**مەسکەر**[٢]: ناوەڵناو. تایبەتمەندی ئەوەی مەست دەکا ‹شەراب، مەسکەرە› ☰ مُسکر؛ مستی‌آور

**مەسکی** / meskî/: ☜ مەستەکی ـ١

**مەسڵەت** / mesłet/: ناو. مەسرەت؛ ڕەوتی ئاشت بوونەوەی دوژمنی خوێنی و نامووسی ☰ آشتی میان دو دشمن خونی و ناموسی

**مەسڵەحە** / mesłeĥe/: ناو. بنکەی دروێنەوانان ☰ بنگاه دروگران

**مەسڵەحەت** / mesłeĥet/: ناو. ڕێوشوێنی دروست و باش کە زیانی کەمتر و خێری زیاتر بێ ☰ مصلحت

**مەسنا** / mesna/: ناو. سارداوە؛ سارداو ☰ سردابە

**مەسنەوی** / mesnewî/: ناو. دووخشتەکی؛ هۆنراوەیێ کە باڵەکانی هەر بەیتێکی پێکەوە هاوپاشڵن و هەموو شیعرەکە لە سەر یەک کێش داڕێژراوە ☰ مثنوی

**مەسوورە** / mesûre/: ☜ ماسۆڵە ـ١

**مەسە** / mese/: ناو. ١. پۆڵای چەقۆ تیژ کردنی قەسابان ٢. مەدوونە؛ خاکەنازی مشکی دەردان ☰ ١. سوهان آهنی قصاب ٢. خاک‌انداز بُخاری

**مەسەب** / meseb/: ناو. ١. ☜ مەزهەب ٢. حەشارگەی کەو ☰ ١. ☜ مەزهەب ٢. کمینگاه کبک شکاری

**مەسەکی** / mesekî/: ☜ مەستەکی ـ١

**مەسەل** / mesel/: ناو. پەندی پێشوونان ☰ مَثَل

**مەسەلە** / mesele/: ناو. ١. مەسەل ‹مەسەلەی مەشهوور جوان و دزێوە/ ئاردی دابێژە قوونی مەبزێوە! «حەقیقی»› ٢. ڕووداوو ٣. پرسیار ☰ ١. مَثَل ٢. رویداد ٣. سؤال

**مەسەو** / mesew/: ☜ مەزهەب

**مەسی** / mesî/: ☜ **مەستی ـ١**

**مەسیحی** / mesîĥî/: ناوەڵناو. دیان؛ خاچپەرست؛ کریستیان؛ شوێنکەوتووی ئایینی عیسا پێغەمبەر ☰ مسیحی

**مەسیر** / mesîr/: ناو. ١. مرەبای کدوو ٢. بگار؛ بوار؛ ڕێگای پێدا چوون ☰ ١. مُربای کدو ٢. مسیر

**مەسین** / mesîn/: ☜ **مسینە**

**مەسینە** / mesîne/: ☜ **مسینە**

**مەسیە** / mesye/: ☜ **مەسێ[١]**

**مەسێ[١]** / mesê/: ناو. مەسیە: ١. بستەی سەر تەندوور؛ سێخێ کە لە سەر تەنوور دەخرێ بۆ شت هەڵواسین ٢. پارچە کانزای سەرپانی دەسکدار بۆ کڕاندن و سڕینی تەنوور و پنە و ساج ☰ ١. سیخ مانند روی تنور ٢. بیلچەی کنار تنور

**مەسێ[٢]**: ئامراز. وشەی گاڵتە پێ کردن ☰ حرف مسخره کردن مخاطب

**مەش[١]** / meş/: ناو. ١. ڕەفتار؛ ڕەوت ٢. ☜ **مێش ـ١** ☰ ١. رفتار؛ مشی ٢. ☜ **مێش ـ١**

**ـ مەش[٢]**: پاشەوشە. کار ‹خۆمەش› ☰ ـکار

**مەشاک** / meşak/: ناو. دار عاسای دەروێشان ☰ عصای دراویش

**مەشالەڤ** / meşalev/: ناو. پاڵا؛ پێتاو ☰ پای‌افزار

**مەشاندن** / meşandin/: چاوگ. پێکهێنانی کار؛ جێبەجێ کردن ☰ انجام دادن

**مەشت** / meşt/: ناو. مەشتە؛ سبحەی؛ سۆزی؛ بەیانی؛ مەستە ☰ فردا

**مەشتا** / meşta/: ☜ **مشتاخ**

**مەشتاخ** / meştax/: ناو. کاری هەڵخستنی توتن لە بەر تاو ☰ کار پهن کردن توتون در آفتاب

**مەشتە** / meşte/: ناو. ١. جۆگەیەک کە قەدەدێراوێ ئاو دەدا ٢. مەشت؛ بەیانی؛ سۆزی ٣. ئەونده زەوین لە دەغل و کێڵگە کە لە جۆگەیەکەوە ئاو دەدرێ ‹دوو مەشتە پیازمان وەشاندووە› ☰ ١. جوبی کە یک ردیف جوب کوچکتر را آب می‌رساند ٢. فردا ٣. آن سطح از زمین کشاورزی کە از یک جوب آب می‌خورد

**مەشتەبێرۆ** / meştebêřo/: ☜ **مەستەبیرۆ**

**مەشتی** / meştî/: ناو/ ناوەڵکار. سبەی؛ سۆزی ☰ فردا

**مەشخەڵ** / meşxeł/: ناو. مەخشەڵ: ١. گڕی بەرزی ئاگر ٢. داری سەربەگڕ ‹وەرە ئاونگی سەر پەلکی گوڵی سوور!/ وەرە ئاورینگی گەرم و مەشخەڵی نوور! «هێمن»› ☰ ١. زبانەی بلند آتش ٢. مشعل

**مەشخەڵان** / meşxełan/: ناو. مەخشەڵان؛ مەشقەڵان؛ مشقەڵان؛ ڕووناکایی زۆر لە بەر گڕی ئاگر ☰ روشنایی زیاد شعلەی آتش

**مەشرووبات** / meşrûbat/: ناو. خواردنەوە؛ تراوی ئەلکولی ☰ نوشابەی الکلی

**مەشرەف** / meşref/: ناو. ڕاوێژ و ڕوو ☰ مشرب؛ خُلق

**مەشرەفخۆش** / meşrefxoş/: ناوەڵناو. ڕاوێژ و ڕوو خۆش ☰ خوش‌مشرب

**مەشفەن** / meşfen/: ناو. مەشوون؛ تاتەشۆر؛ بەردێ کە مردووی لە سەر دەشۆن ☰ تختەسنگ غسالی

**مەشق** / meşq/: ناو. ١. ئەرکی چەندپاتە کردنەوە بۆ شارەزا بوون ‹مەشقی وێۆلون کردن› ٢. کار و ڕەوتی خۆ تەیار کردن؛ ئامادە بوون ‹بۆ ڕۆشتن بۆ فەرەنگ مەشق دەکا› ☰ ١و٢. مشق

⊡ **مەشق پێکردن**: مەشق دان؛ ڕاهێنان؛ فێر کردن بە چەندپاتە کردنەوە ☰ تمرین دادن

**مەشق دان**: ١. ☜ **مەشق پێکردن** ٢. دەستوور دان بە مەبەستی ئەنجام دانی ڕاهێنانێکی دیاریکراو ☰ ١. ☜ **مەشق پێکردن** ٢. مشق دادن

**مەشقەڵان** / meşqełan/: ☜ **مەشخەڵان**

**مەشک** / meşk/: ناو. ١. مەشکە؛ پێستە حەیوانی گووراو کە ماستی تێدا دەژەنن ٢. خێگە؛ هیزە ٣. ورگ؛ عوور ☰ ١. مشک ٢. خیک ٣. اشکمبه

**مەشکاڵە** / meşkałe/: ناو. دەفری چەرمین بۆ میوە و گەزۆ تێدا هەڵگرتن ☰ ظرف چرمی نگهداری میوەی خشک و شیرینی

**مەشکن** / meşkin/: ناوەڵناو. [پەلار] مەشکۆ: ١. ورگن؛ زگزل ٢. زگ با کردوو ☰ ١. شکم‌گنده ٢. شکم بادکرده

**مەشکوێ** / meşk(i)wê/: ناوەڵناو. [پەلار] ورگزل (ژن) ☰ شکم‌گُنده (زن)

**مەشکۆ** / meşko/: ☜ مەشکن

**مەشکۆڵە** / meşkołe/: ناو. مەشکەی گچکە ☰ مشک کوچک

**مەشکوور** / meşkûr/: ☜ مەشکەڕەقە

**مەشکە** / meşke/: ناو. ١. مەشک؛ لێشکە؛ هەڵیزە؛ هەڵیز؛ پێستی خۆشەکراو و دووراوی زۆرتر گا کە ماست و ئاوی تێ دەکەن و دەیژەنن و کەرەی لێ دەگرن ٢. مەسکە؛ خێگە؛ خیە؛ هیز؛ هیزە؛ خیزە؛ وەس؛ وس؛ پێستەی ڕۆن ٣. ☜ مێشك ـ١ ☰ ١. مشک ٢. خیک ٣. ☜ مێشك ـ١

▣ **مەشکەی گاوس**: مەشکە لە پێستی چێڵ ‹ئاهەنگی ژین و شادی بوو، بەیانی کە تێکەڵ دەبوو/ شمشاڵی من، خرمەی بازن، گرم و هۆڕی مەشکەی گاوس «هێمن»› ☰ مشک از پوست گاو

▣ **مەشکە ژەندن**: مەشکە ژەنن؛ ژاندنی مەشکە ☰ مشک زدن

**مەشکە ژەنن**: ☜ مەشکە ژەندن

**مەشکە هەڵخستن**: ماس کردنە مەشکە و ئامادە کردنی لە قەد سێپاوە بۆ ژەندن ☰ مشک بار گذاشتن

**مەشکەبڕە** / meşkeb(i)ře/: ناو. مەشکەدڕە؛ جۆرێ سیسرەی ڕەشە یەکبین زیرەی دێ ☰ جیرجیرک

**مەشکەدڕە** / meşked(i)ře/: ☜ مەشکەبڕە

**مەشکەڕەقە** / meşkeřeqe/: ناو. مەشکوور؛ شەکیلە ☰ چرم خشکیده و بی‌مصرف

**مەشکەژەن** / meşkejen/: ناو. مەشکەژێن؛ مەشکەکیز؛ مەشکەکێز؛ کەسێ مەشکە ڕادەتلەکێنێ بۆ ماست کردنەوە ☰ مشک‌زن

**مەشکەژەنە** / meşkejene/: ☜ مەشکەژەنی

**مەشکەژەنی** / meşkejenî/: ناو. مەشکەژەنە؛ مەشکە ـ مەشکە؛ گەمەیەکە ☰ نوعی بازی

**مەشکەژێن** / meşkejên/: ☜ مەشکەژەن

**مەشکەفی** / meşkefî/: ناو. مەسقەتی؛ مەسقەفی؛ جۆرێک شیرینی لە نیشاستە و شەکر و ماکی بۆنخۆش ☰ مسقطی

**مەشکەکیز** / meşkekîz/: ☜ مەشکەژەن

**مەشکەکێز** / meşkekêz/: ☜ مەشکەژەن

**مەشکە. مەشکە** / meşkemeşke/: ☜ مەشکەژەنی

**مەشکەومەلان** / meşke w mełan/: ناو. مەشکە و سێپا ☰ مشک و سەپایه

**مەشول** / meşûl/: ناو. تێخولی سەرەوەی گوێز و باقی ☰ پوستەی مُحکم گردو و بادام

**مەشون** / meşûn/: ☜ مەشفەن

**مەشە** / meşe/: ناو. ١. ☜ مێش ـ١ ٢. گازی بزمار کێشانەوە ☰ ١. ☜ مێش ـ١ ٢. گازانبر

**مەشەک** / meşek/: ناو. فیشەکەشێتە ☰ فشفشه

**مەشەی** / meşey/: ☜ مەشهەدی

**مەشەیی** / meşeyî/: ☜ مەشهەدی

**مەشهەدی** / meshedî/: ناو. مەشەیی؛ مەشەی: ١. هەرکام لە خەڵکی شاری مەشهەد، ناوەندی پارێزگای خوراسانی ناوەڕاست، لە ڕۆژهەڵاتی باکووری ئێران ٢. کەسێ کە بۆ زیارەت چۆتە مەشهەد ☰ ١و٢. مشهدی

**مەشهەلە** / meşhele/: ناو. مەسەلە ▪ مسئله

**مەشی** / meşî/: ☜ مێش-١

**مەشیا**[1] / meşya/: ئاوەڵناو. شیاو؛ لایق ▪ شایان

**مەشیا**[2]: ئاوەڵکار. دەبوو؛ دەبوایە ▪ می‌بایستی؛ شایسته بود

**مەشین** / meşîn/: چاوگ. ڕۆیشتن؛ ڕۆیین ▪ رفتن

**مەعاش** / me'aş/: ناو. بژیو؛ پیوار؛ پێژی ‹کە بوو بە مەئموور ئەبێتە واشە/ ئیمان و دینی تەنیا مەعاشە «بێکەس»› ▪ معاش

**مەعجۆمە** / me'come/: ☜ مەجومعە

**مەعجەرە** / me'cere/: ☜ محەجەری

**مەعد** / me'd/: ناو. ڕەنگی ڕوو ▪ رنگ رُخساره

**مەعدە** / me'de/: ناو. سیق؛ مەدە ▪ معده

**مەعدەن** / me'den/: ناو. مادەن؛ کانگا ▪ معدن

**مەعدەنووس** / me'denûs/: ☜ مەدەنۆس

**مەعدەنی** / me'denî/: ناو. ئافتاوە ▪ آفتابه

**مەعر** / me'r/: ☜ مار-١

**مەعرەکە** / me'reke/: ناو. ١. چەقەچەق؛ گورەگوڕ ٢. پالان قەجەری؛ جۆرێ کورتان ٣. ئارەقگیری بن زین ▪ ١. جار و جنجال ٢. نوعی پالان ٣. نمد زین

**مەعزووم** / me'zûm/: ئاوەڵناو. بانگهێشتکراو بۆ میوانی و نان خواردن ▪ دعوت شده برای سور

**مەعزەرەت** / me'zeret/: ناو. داوای لێبووردن ▪ معذرت

**مەعلان** / me'lan/: ئاوەڵناو. پسپۆڕ؛ لێزان ▪ خبره؛ ماهر

**مەعلووم** / me'lûm/: ئاوەڵناو. زاندراو؛ ئاشکرا ▪ معلوم

**مەعنا** / me'na/: ناو. مانا؛ واتا؛ کاکڵی قسە ▪ معنی

**مەعنەوی** / me'newî/: ئاوەڵناو. پەژۆنی؛ واتایی؛ پێوەندیدار بە بیر و هەستەوە ▪ معنوی

**مەعین** / me'în/: ☜ ماین

**مەغار** / meğar/: ☜ مەغارە

**مەغارە** / meğare/: ناو. مخارە؛ مغار؛ مغارە؛ مەغار؛ موغارە؛ مەخەرا؛ ئەشکەوتی کووڕ ▪ غار عمیق

**مەغازە** / meğaze/: ناو. مغازە؛ موغازە؛ دووکان؛ دوکان؛ تکان؛ کۆگا؛ فرۆشگا؛ جێگەی فرۆشتن ▪ مُغازه

**مەغریب** / meğrîb/: ناو. مەخرەب؛ موخورب؛ مەغریو؛ دەمی خۆرنشین ‹ئەستێرەی مەغریب وەک قەترەی ئەمەل/ کزکز ئەتکێتە ناو بەفری سەرکەل «گۆران»› ▪ غروب

**مەغریو** / meğrîw/: ☜ مەغریب

**مەغز** / meğz/: ☜ مێشك-١

**مەغزدار** / meğzdar/: ئاوەڵناو. بە کاکڵ ▪ مغزدار

**مەغلووب** / meğlûb/: ئاوەڵناو. ژێرکەوتوو لە بازی و شەڕدا ▪ مغلوب

**مەغلووبە** / meğlûbe/: ناو. ڕەوتی تێکچڕژانی دوژمنان لە شەڕدا ▪ جنگ مغلوبه

**مەغموون** / meğmûn/: ئاوەڵناو. زیاندیتە لە سەودا ▪ مغبون

**مەغەل** / meğel/: ☜ مەخەل

**مەفا** / mefa/: ناو. ١. بەهرە؛ قازانج ٢. مفا؛ شفا؛ ڕەوتی چابوونەوە لە نەخۆشین ▪ ١. سود؛ بهره ٢. شفا

**مەفتوول** / meftûl/: ناو. ١. تەرزی داری ڕەز ٢. تەل؛ تێل؛ سیم؛ هەودای باریکی کانزایی ▪ ١. تارِ تاک ٢. مفتول

**مەفرەشبار** / mefreşbar/: ناو. دوو تا باری پڕ لە کا کە لە بارەبەر دەندرێ و نەخۆشی لە سەر ڕادەکێشن بۆ گوێزانەوە ▪ بار چارپا از کاه برای حمل بیمار

**مەفرەق** / mefreq/: ناو. کانزایەکە مس و قەلایی تێکەڵاو، حەوجۆشی لێ دروست دەکەن ▪ مفرغ

**مەفسك / mefsik/**: ناو. کەوگیر 🇮🇷 کفگیر

**مەفەرە / mefere/**: ناو. جۆرێ ترێ 🇮🇷 نوعی انگور

**مەڤلاندن / mevlandin/**: چاوگ. تێ‌هەڵسوون؛ ڕەنگ کردن 🇮🇷 اندودن

**مەڤلین / mevlîn/**: چاوگ. تێ‌هەڵسووران؛ پێدا ساوران 🇮🇷 اندوده شدن

**مەڤیژ / mevîj/**: ☜ مێوژ

**مەقاچ / meqaç/**: ☜ مەقاش

**مەقارە / meqare/**: ☜ مەقاش

**مەقاش / meqaş/**: ناو. ماشە؛ مقاش؛ مەقارە؛ مەقاشە؛ مەقاچ؛ پەنگر؛ ماشەی پۆل گرتن 🇮🇷 انبُر

**مەقاشە / meqaşe/**: ☜ مەقاش

**مەقالە / meqale/**: ناو. وتاری نووسراو 🇮🇷 مقاله

**مەقام / meqam/**: ناو. ۱. قام؛ ستران؛ گۆرانی؛ مقام؛ لاوژە ۲. پلە و پایە؛ جێگا 🇮🇷 ۱. ترانه ۲. مقام

**مەقاو / meqaw/**: ناو. مقاو؛ مقایی؛ نەخۆشییەکی یەکسمە لە سەرماوە تووشی دێ 🇮🇷 نوعی بیماری ستور

**مەقسوک / meqsuk/**: ☜ مقەسۆك

**مەقسووک / meqsûk/**: ناو. پەڕەسێلکەی باڵدرێژی پا کورت 🇮🇷 پرستو

**مەقلووم / meqlûm/**: ئاوەڵناو. ئاوەژووکراو؛ وەرگێڕاو 🇮🇷 وارونه؛ مقلوب

**مەقولات / mequlat/**: ☜ محەلەق

**مەقەرشەر / meqerşer/**: ناو. نوخۆشەر؛ نخۆشەر؛ لەپە 🇮🇷 لپه

**مەقەڕنە / meqeřne/**: ☜ ماکارونی

**مەقەس / meqes/**: ☜ مقەست

**مەقەست / meqest/**: ☜ مقەست

**مەقەستە / meqeste/**: ☜ مقەستە

**مەقەسەک / meqesek/**: ناو. جۆرێ کولەی درشت 🇮🇷 نوعی ملخ درشت

**مەقەشەر / meqeşer/**: ناو. نخۆشەر؛ لەپە؛ لەتکە نۆک 🇮🇷 لپه

**مەقەڵە / meqełe/**: ناو. جۆرێ گەمەی منالان 🇮🇷 نوعی بازی کودکان

**مەقەڵی / meqełî/**: ☜ مەنقەڵ

**مەک¹ / mek/**: ناو. نمەک؛ خوێ؛ خوا 🇮🇷 نمک

**مەک²**: پێرۆ. ← شتومەك

**مەکات / mekat/**: ناو. پووشانە؛ سەرانەی ئاژەڵ 🇮🇷 سرانەی دام

**مەکار / mekar/**: ☜ مەکاڵ

**مەکارە / mekare/**: ناو. ۱. ئامرازی دار کۆڵینی دارتاش ۲. قرقڕەی جلدروو ۳. عەرەبانەی ئازووخە کێشانەوە ٤. یەکسمی چاروێدار کە بە کرێ دەدرێ ٥. بەکرە؛ بەنی دروومان 🇮🇷 ۱. ابزار چوب کندن ۲. قرقرەی خیاط ۳. ارابەی حمل ارزاق ۴. الاغ کرایەای ۵. نخ خیاطی

**مەکارەچی / mekareçî/**: ناو. چاروێدار؛ کەسێ کە یەکسم بە کرێ دەدا 🇮🇷 چاروادار

**مەکاڵ / mekał/**: ئاوەڵناو. مەکار؛ بەیار؛ نەکێڵراو 🇮🇷 بایر

**مەکتەب / mekteb/**: ناو. مەکتەڤ؛ مەکتەو؛ قوتابخانە: ۱. فێرگە؛ مەدرەسە ‹منداڵان لە مەکتەبن› ۲. ڕێباز؛ ئایین یا ئامۆژەیەکی تایبەت ‹مەکتەبی کانت› ۳. شێواز؛ ڕێباز؛ شێوەی هونەری یان ئەدەبی ‹مەکتەبی ڕۆمانتیسم› 🇮🇷 ۱. مدرسه ۲و۳. مکتب

**مەکتەبی / mektebî/**: ناو. قوتابی ‹قەڵەم دەست دەیە ببە مەکتەبی/ وەخت و بێ وەخت لە خوێندن نەبی! «هەژار، *بۆ کوردستان*»› 🇮🇷 دانش‌آموز

**مەکتەڤ / mektev/**: ☜ مەکتەب

**مەکتەو / mektew/**: ☜ مەکتەب

**مەکدان / mekdan/**: ناو. نمەکدان؛ خوێدان 🇮🇷 نمکدان

**مەکر / mekr/**: ناو. ۱. ناز؛ پەڵپی نازدارانە ‹کەسێ

دەرچوو لە داوی مەکری دنیا/ کە مەردانە تەلاقی سێبەسێ دا «ناری»› ۲. فێڵ؛ گزی ▪ ۱. ناز و نیمناز ۲. حیله؛ مکر

**مەکرباز** / mekrbaz/: ئاوەڵناو. مەکرۆ: ۱. مەکرین؛ ناز و نووزکەر ‹من سوێنت ئەدەم شۆخی مەکرباز!/ وە عشوە و غەمزە، وە دیدەی تەناز «مینەجاف»› ۲. ساختەچی؛ فێڵباز ▪ ۱. عشوەگر؛ نازکننده ۲. حیلەگر؛ مکار

**مەکربازی** / mekrbazî/: ناو. تیتاڵی ▪ حیلەگری

**مەکرۆ** / mekro/: ☜ مەکرباز

**مەکرۆف** / mekrof/: ئاوەڵناو. ۱. ناڕەوا؛ نابەجێ ۲. ناشیرین؛ گرانجان ▪ ۱. مکروه؛ ناروا ۲. زشت؛ کریه

**مەکری** / mekrî/: ناو. وەین؛ گزی و فێڵ ▪ مکر؛ نیرنگ

**مەکرین** / mekrîn/: ☜ مەکرباز-۱

**مەکس** / meks/: ناو. قسەی سەرزارەکی بەبێ کردەوە ▪ تعارف بی‌عمل

**مەکوک** / mekuk/: ناو. مەلیم؛ بەڵەک ▪ گیاه شیرین‌بیان

**مەکۆ** / meko/: ناو. ۱. جێگەی کۆ بوونەوە ‹مەکۆی جەردە و چەتان بوو دەیوەخانی/ غولام و نۆکەری بوون نانی نانی «هێمن»› ۲. کۆ؛ کۆگا؛ جێگەی بە سەر یەکا کراوی شت ‹گر گرتی و کەوتە هەر دوو لامان/ دل بۆتە مەکۆی برین و زامان «هەژار، مەم و زین»› ۳. ☜ ماکو ▪ ۱. مُجتمع ۲. جای انباشته شدن چیزی ۳. ☜ ماکو

▣ **مەکۆ دان**: ۱. کۆما کردن لە شوێنێکدا ۲. کۆ بوونەوە لە شوێنێکدا ▪ ۱. توده و انباشته کردن در جایی ۲. گرد آمدن

**مەکۆر** / mekor/: ناو. بۆسە؛ ڕەبەت؛ شوێنی خۆ لێ مەڵاس دان ▪ کمین

**مەکۆگە** / mekoge/: ناو. مەکۆ؛ بینا و شوێنی مانەوەی کەس، خێڵ یان ڕێکخراوەیەک ▪ مقر

**مەکو** / mekû/: ☜ ماکو

**مەکوب** / mekûb/: ناو. ساقۆڕ؛ سەبەتەی زۆر زل ▪ سبد بزرگ

**مەکوک** / mekûk/: ناو. ۱. ☜ ماکو ۲. مەکیک؛ بەڵەک؛ گیایەکە ▪ ۱. ☜ ماکو ۲. گیاه شیرین‌بیان

**مەکوکە** / mekûke/: ☜ ماکو

**مەکی** / mekî/: ناو. خوێ؛ خوا؛ مەک ▪ نمک

**مەکیک** / mekîk/: ناو. ۱. ☜ ماکو ۲. ☜ مەکوك-۲

**مەکین** / mekîn/: ئاوەڵناو. جوانی دلکێش ▪ زیبای نمکین

**مەکینە** / mekîne/: ناو. ۱. ماشێن ۲. ماشێنەی جل دروون ▪ ۱. ماشین ۲. چرخ خیاطی

**مەکینەچی** / mekîneçî/: ناو. ۱. کەسێ کە لە ماشێن شارەزایە ۲. خەیاتێ کە بە ماشێنە شت ئەدوورێ ▪ ۱. تکنیسین ۲. خیاطی که با چرخ کار می‌کند

**مەگاو** / megaw/: ☜ مانگا

**مەگرتی** / megirtî/: ئاوەڵکار. گرتمان؛ گریمان؛ وامان دانا ▪ به فرض

**مەگرووم** / megrûm/: ناو. پارچەیەکی جوان و بەقیمەتە بۆ کراس ▪ نوعی پارچەی قیمتی

**مەگریجەنی** / megrîcenî/: ناو. مقەست؛ قەیچی؛ تۆرتۆ ▪ قیچی

**مەگس** / megis/: ناو. شڵخەمێشی لە دەشت ▪ زنبور عسل به کندو نرفته

**مەگنەتیک** / megnetîk/: ناو. مەگەن؛ میغناتیز ▪ مغناطیس

**مەگەر**[۱] / meger/: ئاوەڵکار. مەگەن؛ مەگین: ۱. وشەی پرسیار ‹مەگەر نەمگوت؟؛ مەگەر نەبووی؟› ۲. وشەی مەرج ‹نەخۆشی دەردی هیجرانم،

ویسالی تۆیە دەرمانم/ شیفام نایە مەگەر بێنێ نەسیمی پەرچەمت بێنێ «حەریق»» ≡ ١و٢. مگر

**مەگەر**[٢]: ئامراز. مەگەن؛ مەگین: ١. تەنیا ‹تەبیبی من دەبێ دەخلی هەبێ، ساحیب ئیشارەت بێ/ مەگەر چاوت بزانێ من لە بەر چی مەست و بیمارم «نالی»› ٢. بێجگە؛ بەجگە ‹دەمێکی مەست و بیمارم، دەمێک بێهۆش و هۆشیارم/ چ کەس نازانێ دەردی من، مەگەر ئەو چاوە کالانە «وەفایی»› ٣. بەڵکوو؛ بەو هیوایە؛ بەشکم ‹بە حەسرەت عومری من یەکبارە فەوتا/ مەگەر عومرێ دووبارەم پێ عەتا کەی «نالی»› ٤. شایەد تەنیا ‹نرخی ناسکۆڵەی جوانێ/ مەگەر هەر شاعیر بیزانێ «کامەران موکری»› ≡ ١تا٤. مگر

**مەگەز** / megez/: ☜ مێش-١

**مەگەزە** / megeze/: ناو. چاوئێشەیەک کە لە مەگەزەوە پەیدا دەبێ ≡ نوعی چشم درد

**مەگەس** / meges/: ☜ مێش-١

**مەگەن**[١] / megen/: ناو. میغناتیز؛ مەگنەتیک ≡ مغناطیس

**مەگەن**[٢]: ☜ مەگەر

**مەگیرانی** / megîranî/: ناو. مەبرانی؛ مەهگران؛ مەهبیران؛ مەورانی؛ مەوریان؛ بێزوو؛ بێزی؛ بێزگ؛ کەرب؛ بێز و وازی ژن لە سەرەتای زگپڕیدا ≡ ویار

**مەگیرانیکەر** / megîranîker/: ئاوەڵناو. بێزگەوان؛ بێزووکەر ≡ ویاردار

**مەگین** / megîn/: ☜ مەگەر

**مەگێز** / megêz/: ناو. ئیشتیا؛ وازی خواردن ≡ اشتها

**مەل** / mel/: ناو. ١. باڵندە؛ باڵدار؛ پەلەوەر ‹چریکەی مەلان چوون حەنجەرەی عوود/ مەر دەنگ چلچەنگ پەنجەی باربوود «سەید فەتاح جەبباری»› ٢. جانەوەری پچکۆلە ‹مەل و مۆری لە ناو هێلانە خەوتوو/ ئەیانکا شەوقی شۆلەی شەم، شەوارە «کاک ئەحمەد»› ≡ ١. پرندە ٢. جانور ریز

**مەلا** / mela/: ناو. ملا؛ مللە؛ مۆللا؛ مەلێف؛ مەلا؛ مەلڵا؛ مەلێ: ١. زانای ئایینی ٢. سەرمەلا؛ سەرۆکی گەمە ≡ ١. آخوند ٢. رییس بازی

**مەلابانگان** / melabangan/: ☜ مەلابانگدان

**مەلابانگدان** / melabangdan/: ناو. مەلابانگان؛ مەلابانگدان؛ شەوەکی؛ سەرەتای ڕۆژ بوونەوە ≡ فجر؛ سرآغاز صبح

**مەلابەزێن** / melabezên/: ئاوەڵناو. [کینایە] قسەزانی لەزەبر ≡ بسیار سخندان

**مەلات** / melat/: ☜ مەڵات

**مەلاتەقتەقێن** / melateqteqên/: ناو. مەلاتەق تەقێنە؛ گەمەیەکی شەوانەیە ≡ نوعی بازی

**مەلاتەقتەقێنە** / melateqteqêne/: ☜ مەلاتەقتەقێن

**مەلاتی** / melatî/: ☜ مەلایەتی

**مەلاح** / melaĥ/: ئاوەڵناو. بەدەس و برد؛ لێزان؛ کارامە؛ ماهیر ≡ ماهر؛ خبره

**مەلاخۆر** / melaxor/: ئاوەڵناو. [پلار] مەلاخۆرە؛ کەمقیمەت ≡ ارزان

**مەلاخۆرە** / melaxore/: ☜ مەلاخۆر

**مەلازادە** / melazade/: ناو. بەچکە مەلا ≡ آخوندزاده

**مەلاژگ** / melajig/: ☜ مەلاشوو

**مەلاژن** / melajin/: ناو. ژنی مەلا ≡ همسر آخوند

**مەلاژوو** / melajû/: ☜ مەلاشوو

**مەلاژە** / melaje/: ناو. مەرازە؛ ئاڵوو؛ بادامەی قورگ ≡ لوزتین

**مەلاعەلیک** / mela'elîk/: ناو. باڵندەیەکی پچکوولەیە ≡ پرندەای کوچک

**مەلافە** / melafe/: ناو. مەلەفە؛ چەرچەف؛ بەرگە

دۆشەک و بالگە ☰ ملافه

**مەلاڤی / melavî/**: ناو. جۆرێ ئەمرۆ ☰ نوعی گلابی

**مەلاق¹ / melaq/**: ناو. ١. رووبینی ٢. مەلاقی؛ ئاونگ؛ ترێی هەلگیراو بۆ زستان ☰ ١. تملق ٢. آونگ

**مەلاق²**: ئاوەلناو. رووخۆشی تەفرەدەر ☰ فریبکار

**مەلاقە / melaqe/**: ناو. ئەسکوێ؛ ئەسکوو ☰ ملاغه

**مەلاقی / melaqî/**: ☜ **مەلاق¹-٢**

**مەلاک / melak/**: ناو. ١. جەرگ ٢. جەرگ و ناو ☰ ١. جگر ٢. دل و جگر و قلوه

**مەلاهیم / melahîm/**: ئاوەلناو. ١. خاوەن بەزەیی ٢. نەرم و نیان ٣. ناسک و شلک ☰ ١. مُشفق ٢. نرمخو ٣. نازک و لطیف

**مەلایکە / melay(i)ke/**: ناو. ملاکەت؛ ملیاکەت؛ مەلایکەت؛ مەلایەکەت؛ مەلکە؛ مەلەک؛ مەلیاکەت؛ فرشتەی خوا ☰ ملائکه

**مەلایکەت / melay(i)ket/**: ☜ **مەلایکە**

**مەلایەتی / melayetî/**: ناو. مەلایەتی؛ مەلایی؛ مۆلەیەی؛ مەلاتی؛ مەلایی؛ مەلـلایەتی؛ کاری مەلا ☰ مُلایی

**مەلایەکەت / melayeket/**: ☜ **مەلایکە**

**مەلتیک / meltîk/**: ناو. سێوەترشەی پاییزی ☰ سیب تُرش پاییزی

**مەلخاکی / mexakî/**: ناو. پیرۆشک؛ خلێرە؛ خلێرە ☰ خرخاکی

**مەلخاندن / melxandin/**: چاوگ. شاردنەوە ☰ پنهان کردن

**مەلخین / melxîn/**: چاوگ. خۆ شاردنەوە ☰ پنهان شدن

**مەلزیڕنەک / melzîřnek/**: ناو. شیرشیرە؛ بەرزەچڕ ☰ جیرجیرک

**مەلس / mels/**: ناو. مەلاس؛ ڕەوتی بە زەوییەوە چەسپان ☰ عمل بر زمین چسبیدن

**مەلساندن / melsandin/**: چاوگ. مەلسین؛ خۆ مەلاس دان؛ بە زەوییەوە نووساندن ‹مریشکێکی قەلەو خۆی لە سەر هێلکان مەلساندبوو› ☰ بر زمین چسباندن

**مەلسین / melsîn/**: چاوگ. ١. ☜ **مەلساندن** ٢. ورد و خاش بوون ☰ ١. ☜ **مەلساندن** ٢. خُرد و خمیر شدن

**مەلشە / melşe/**: ناو. کەلمێش؛ مێشی درشت ☰ مگس درشت

**مەلعون / mel'ûn/**: ☜ **مەلون**

**مەلغە / melğe/**: ناو. کەڕانە؛ لۆسە؛ باری؛ نوێل ☰ اهرُم

**مەلقاندن / melqandin/**: چاوگ. ١. هەلواسین؛ هەلخستن ٢. فلیقاندنەوە؛ تلێقهاندنەوە ٣. گەیاندنی میوە بە گوشین و دە تەرە خستن ☰ ١. آویزان کردن ٢. لهانیدن ٣. رساندن مصنوعی میوه

**مەلقە / melqe/**: ناو. جۆرێ خواردەمەنی ☰ نوعی خوراکی

**مەلقەپ / melqep/**: ناو. ئامرازێکی دار کۆلین ☰ وسیله‌ای برای حکاکی چوب

**مەلقین / melqîn/**: ناو. ١. فلیقان؛ تلێقیان ٢. *[مەجاز]* مەرایی کردن؛ خولتە کردن ☰ ١. له شدن ٢. چاپلوسی کردن

**مەلکە / melke/**: ناو. ١. زارۆی خڕەکە و بەکەیف ٢. سەرپالەی دروێنە ٣. ☜ **مەلایکە** ☰ ١. کودک تُپُل و سرحال ٢. سردستەی دروگران ٣. ☜ **مەلایکە**

**مەلکەب / melkeb/**: ناو. قەرتالە؛ تریان؛ سەبەتەی بچووک ☰ سبد کوچک

**مەلکەزان / melkezan/**: ناو. *[باوەری کۆن]* فرشتەی سەرپەرشتی دەخل و دان و شینایی و زاوزوو ☰

فرشتەی تولید و ارزانی

**مەلکەس** / melkes/: ناو. گەسکی لە شووڵ ▣ جاروی از ترکه

**مەلکەمۆت** / melkemot/: ناو. مەلکەمووت؛ مەلکەمۆت؛ عیزرایل؛ ئیزرایل؛ پێمێردی خودا ▣ عزرائیل

**مەلکەموت** / melkemût/: ☚ مەلکەمۆت

**مەلملین** / melm(i)lîn/: چاوگ. ململین؛ جیـنگڵ دان ▣ خزیدن

**مەلمەل** / melmel/: ناو. مەرمەڕشا؛ خامی هەرەسپی کە دەکرێتە کراسی پیاوانە ▣ ململ

**مەلو** / meliw/: ☚ مەلۆ

**مەلوچک** / meluçik/: ☚ چۆلەکە

**مەلومۆر** / mel û mor/: ناو. جڕ و جانەوەر؛ هەموو گیاندارانی ئاقارێک ‹مەل‌ومۆری لە ناو هێلانە خەوتوو/ ئەیانکا شەوقی شۆلەی شەم، شەوارە «کاک ئەحمەد»› ▣ پرنده و چرنده

**مەلویچکە** / melwîçke/: ☚ چۆلەکە

**مەلۆ** / melo/: ☚ مەلۆ

**مەلۆتک** / melotik/: ☚ مەلۆتکە

**مەلۆتکە** / melotke/: ناو. مەلۆتک؛ مەلۆرتک؛ مەلۆرتکە؛ ماتۆلکە؛ مادک: ١. بابۆلەی زارۆ تێوەپێچان ٢. منالی ساوای لە بابۆلەدا ▣ ١. قُنداق بچه ٢. نوزاد در قنداق

**مەلۆرتک** / melortik/: ☚ مەلۆتکە

**مەلۆرتکە** / melort(i)ke/: ☚ مەلۆتکە

**مەلۆک** / melok/: ☚ مەلۆ

**مەلۆنی** / melonî/: ناو. مەلەوانی؛ سۆبایی ▣ شناگری

**مەلۆو** / melow/: ناو. مەلەوان؛ سۆبایی‌کەر ▣ شناگر

**مەلو** / melû/: ناو. شاوە؛ شینەشاهۆ ▣ بوتیمار

**مەلوچ** / melûç/: ☚ چۆلەکە

**مەلوچک** / melûçik/: ☚ چۆلەکە

**مەلورە** / melûre/: ☚ مێرووله

**مەلول** / melûl/: ئاوەڵناو. ١. پەرێشان‌حاڵ ٢. خەمبار؛ کز (بۆ مرۆ) ٣. کز (بۆ گوڵی چرا) ▣ ١. افسُرده ٢. غمگین ٣. کم سو

⊡ **مەلول کردن**: کز کردنی گوڵی چرا ▣ کم کردن شعله

**مەلولاو** / melûlaw/: ناو. ڕیتکە؛ شلکێنە؛ مەلاو ▣ خمیر آبکی

**مەلولی** / melûlî/: ناو. کزی و خەمباری ‹دڵنیام کە بینیم/ ... تینوێتیم کارێزی ئەتەقێ و/ مەلوولیم سایەقە ئەکات و ئاسمانی ڕۆحی ئەو باوەشی پیا ئەکەن «شێرکۆ»› ▣ پریشانی

**مەلون** / melûn/: ئاوەڵناو. مەلعوون؛ نفرەلێ‌کراو ▣ ملعون

**مەلە** / mele/: ناو. ١. مەلێ؛ مەلە؛ سۆبایی ٢. مەلێ؛ کاری خۆ شتن ٣. ماڵەی قوڕەکاری ٤. جۆرێ کرمی ناو زگ ٥. ☚ کولە ـ١ ▣ ١. شنا ٢. آبتنی ٣. مالەی بنایی ٤. نوعی کرم شکمی ٥. ☚ کولە ـ١

⊡ **مەلە دان**: حەمام دان؛ شۆردن ‹منالەکانم مەلە داوە جوان بوون› ▣ حمام دادن؛ شُستن

**مەلە کردن**: ١. سۆبایی کرن ‹نانا نارۆم، مەلەی دەکەم/ لە نێو دەریای مەندی خەیاڵ «هێمن»› ٢. ئاو بە خۆدا کردن ٣. حەمام کردن؛ خۆ شۆردن ▣ ١. شنا کردن ٢. آبتنی کردن ٣. حمام کردن

**مەلەباسکە** / melebaske/: ناو. باسکەمەلە؛ دەسمەلە ▣ شنای کرال

**مەلەتیک** / meletîk/: ناو. مەلتیک؛ جۆرێ سێوەپاییزە ▣ نوعی سیب پاییزی

**مەلەخان** / melexan/: ☚ ماڵەغان

**مەلەڕۆژە** / meleřoje/: ناو. باڵندەیەکی زۆر

بچووک و بزۆزە، دندووکی درێژ و باریک و خوارە، شـیرەی گـولان دەمـژێ، لـە نێـو پنچکـان، مێشەلان، دار و باخـدا دەژی، هێلانەکـەی وەک هەرمێ بە لقی دار و پنچکانـەوە هەڵدەواسـێ ⚑ شهدخور

**مەلەڕەشە** / meleřeşe/: نـاو. سـێروو؛ ڕەشۆڵـە؛ ڕیشۆڵە ⚑ سار

**مەلەز** / melez/: ناو. دووڕڕە؛ دووڕەگە ⚑ دورگه

**مەلەزان** / melezan/: ناو. مەلەوان ⚑ شناگر

**مەلەزکەتان** / melezketan/: ناو. جۆرە کراسـێکی ژنانەیە ⚑ نوعی پیراهن زنانه

**مەلەزوانە** / melez(i)wane/: ناو. نێرومـێ؛ نـەڕما؛ نەڕمادە ⚑ نرومادە؛ سگک

**مەلەزە** / meleze/: نـاو. شـیما؛ وێنەیـەک بێوردەکاری کە بە چەند هێڵ بابەتەکە بگەیێنێ ⚑ شِما

**مەلەس**[1] / meles/: ناو. ١. جۆرێ پارچەی ئاوریشم ٢. کۆڵوانە؛ چارۆکە ⚑ ١. نوعی پارچەی ابریشمی ٢. شِنِل (زنانە)

**مەلەس**[2]: ئاوەڵناو. مزر؛ ترش و شـیرین پێکـەوە ⚑ ملس

**مەلەسە** / melese/: ئاوەڵناو. ناحاڵی؛ گوێنـەبیس؛ خیشەسەر ⚑ خیرەسر

**مەلەسەک** / melesek/: ناو. ماڵ و سامان؛ دارایـی ⚑ دارایی

**مەلەسی** / melesî/: نـاو. جـۆرێ هـەناری تـرش و شیرین ⚑ نوعی انار ملس

**مەلەشە** / meleşe/: نـاو. جـۆرێ مێشـوولەی دندووک درێژ ⚑ نوعی پشه

**مەلەفە** / melefe/: ☜ مەلافە

**مەلەڤان** / melevan/: ☜ مەلەوان

**مەلەق** / meleq/: نـاو. پشـتەک؛ سـەرمەقولات ⚑ مُعلَّق

**مەلەک** / melek/: ☜ مەلایکە

**مەلەکوڕ** / melekuř/: ☜ کولە ـ١

**مەلەکە** / meleke/: ناو. قەڕاڵیچە؛ شاژن ⚑ ملکه

**مەلەگە** / melege/: ناو. شـوێنی مەلـە کـردن ⚑ محل شنا

**مەلەگەوێ** / melegewê/: ☜ ملەگەوێ

**مەلەم** / melem/: ☜ مەڵهەم

**مەلەموچک** / melemûçik/: نـاو. براتووتـە؛ تبلـی نێوان تووتە و بالا بەرزە ⚑ انگشت بُنصر

**مەلەوان**[1] / melewan/: نـاو. مەلەڤـان: ١. گـەمی ئاژۆ ٢. مەلەزان ⚑ ١. ملوان کشتی ٢. شناگر

**مەلەوان**[2]: ئاوەڵناو. *[کنایە]* مەلەڤـان؛ زۆر لێهـاتوو و لێزان (... لە فارسیدا مەلەوانم، لە عەرەبیدا تـام لـە دنیادا نییە! «هەژار، چێشتی مجێور») ⚑ توانا

**مەلەوانی** / melewanî/: ناو. ١. کاری گەمیە ئـاژۆ ٢. سۆبایی ٣. کـاری ئـاو بـە خـۆدا کـردن ⚑ ١. کشتیرانی ٢. شناگری ٣. آبتنی

**مەلەوەڕێگر** / meleweřêgir/: نـاو. سیسـارگ؛ سسارک ⚑ کرکس

**مەلهەب** / melheb/: ☜ ملهێب

**مەلهەم** / melhem/: ☜ مەڵهەم

**مەلهەمە** / melheme/: نـاو. خۆیـان؛ مالاخمـە ⚑ خرمن هنوز باد دادە نشدە

**مەلهەمێن** / melhemên/: ئاوەڵناو. لەسـەرخۆ؛ نەرمونیان ⚑ متین

**مەلیاکەت** / melyaket/: ☜ مەلایکە

**مەلیچک** / melîçik/: ☜ چۆلەکە

**مەلیچلێ** / melîç(i)łê/: ☜ چۆلەکە

**مەلیچە** / melîçe/: ☜ چۆلەکە

**مەلیس** / melîs/: ناو. ١. ☜ **مەجلیس** ٢. قەیسی لـە ئـاودا خووسـاوی وەک خۆشـاو ⚑ ١. ☜ **مەجلیس** ٢. برگە زردآلوی خیسیدە

**مەلیشکە** / melîşke/: ☜ چۆلەکە

**مەلیلە / melîle**/: ناو. جۆرێک زەنگیانەی دریژۆکەیە، ژنان ئۆیەی پێ دەگرنەوە بۆ قەراغ دەسماڵ ☚ نوعی منجوق

**مەلیم / melîm**/: ناو. بەلەک؛ مەکوک ☚ گیاه شیرین‌بیان

**مەلیە / melye**/: ☜ **کولە ـ١**

**مەلێ / melê**/: ناو. ١. ☜ **مەلە ـ١** ٢. ☜ **مەلا**

**مەلێڤ / melêv**/: ☜ **ملهێب**

**مەلێم / melêm**/: ناو. مەلیم؛ بەلەک؛ شیرین‌بەلەک؛ شیرین‌بەیان ☚ شیرین‌بیان

**مەڵا / meła**/: ☜ **مەلا**

**مەڵات / mełat**/: ناو. مەلات؛ قوڕی نێوان خشت و بەرد لە بەنناییدا ☚ ملات

**مەڵاز / mełaz**/: ناو. ملاز؛ مەلاس ☚ کمین

◘ **مەڵاز بردنەوە**: مەلاز گرتن؛ خۆ مەلاز دان؛ خۆ بە زەمینەوە چەسپاندن و چاوەنۆڕی دەرفەت بوون ☚ کمین کردن

**مەڵاز گرتن**: ☜ **مەڵاز بردنەوە**

**خۆ مەڵاز دان**: ☜ **مەڵاز بردنەوە**

**مەڵازە / mełaze**/: ☜ **مەڵاشو**

**مەڵاژ / mełaj**/: ☜ **مەڵاشو**

**مەڵاژگ / mełajig**/: ☜ **مەڵاشو**

**مەڵاژی / mełajî**/: ☜ **مەڵاشو**

**مەڵاس[١] / mełas**/: ☜ **مەڵاز**

**مەڵاس[٢]**: ناوەڵناو. شل و شەویق و کار لە دەس نەهاتوو ☚ سُست و بیکارە

**مەڵاشک / mełaşik**/: ☜ **مەڵاشو**

**مەڵاشۆ / mełayeşo**/: ☜ **مەڵاشو**

**مەڵاشو / mełaşû**/: ناو. ملاژگ؛ ملاژی؛ ملاشک؛ ملاییژە؛ مەلاژ؛ مەلاژوو؛ مەلاژی؛ مەلاژگ؛ مەلازە؛ مەلاشک؛ مەلاشۆ؛ ملازگ: ١. بەشی پێشەوەی ئێسکی سەری منالی ساوا کە هێشتا نەگرساوە ‹جاران تۆزێک شیریان لە مەلاشووی منداڵ ئەدا و تووکە سەریان ئەکێشا، تا مەلاشووی بهێننەوە› ٢. لاوس؛ سەخ؛ ئاسمانە؛ نەرمایی بنی ئاسمانەی دەم کە پەردەیەک داپۆشیوە ‹زمانی ناوە بە مەلاشوویەوە و ئەگری؛ ئەو نانە بە مەلاشوومەوە نووساوە› ٣. شوێنی مەلاشوو لە سەری مرۆڤی گەورەدا ‹مەلاشوو تەڕ نەبێ، دەسنوێژی دروستە؟› ☚ ١. ملاج ٢. نرم‌کامە ٣. ملاج

◘ **مەڵاشو کەوتن**: مەلاژگ کەفتن؛ پرخە کردنی منداڵی ساوا کە گوایە بە هۆی کەوتنی ئاسمانەی نەرمی دەم ڕوو دەدا ☚ سق افتادن

**مەڵاشو گرتنەوە**: ☜ **مەڵاشو هێنانەوە**

**مەڵاشو هەڵدانەوە**: ☜ **مەڵاشو هێنانەوە**

**مەڵاشو هێنانەوە**: مەلاشوو گرتنەوە؛ مەلاشوو هەڵدانەوە؛ کێشانی تووکە سەری مەلاشوو یان قامک پێوە نانی مەلاشووی ناو دەم بۆ خستنەوەی جێگای مەلاشووی کەوتوو ☚ جا انداختن سق

**مەڵاق / mełaq**/: ناو. قوڕگ؛ مەڵەق ‹مەلاقم وشک بووە› ☚ گلو

**مەڵاک / mełak**/: ناو. ١. کەوچک؛ کەفچی ٢. جەرگ و ناو ☚ ١. قاشق ٢. دل و جگر و قلوە

◘ **مەڵاک کردن**: ☜ **مێلاک کردن**

**مەڵامەت / mełamet**/: ناو. ١. هۆ؛ سەبەب ٢. سوڕ؛ نهێنی ☚ ١. علت ٢. راز

**مەڵان / mełan**/: ناو. سێ‌پای مەشکە ☚ سەپایەی مَشک

**مەڵاو / meław**/: ناو. شلکێنە؛ ڕیتکە ☚ خمیر آبکی

**مەڵایەتی / mełayetî**/: ☜ **مەلایەتی**

**مەڵایی / mełayî**/: ☜ **مەلایەتی**

**مەڵبەن / mełben**/: ☜ **مەڵبەند**

**مەڵبەند / mełbend**/: ناو. مەڵبەن؛ مەڵوەن: ١. سەرزەمینی جێگە ژیان ‹غەیری مەڵبەندی ژیانم

چونکە ئەو/ وەک بەهەشتە دەشت و کێو و بەنـدەنی «حەقیقی»› ٢. کان؛ جان؛ مەعدەن ▭ ١. منطقـه ٢. معدن

**مەڵغە / melğe**/: نـاو. مالیلە؛ مانیلا؛ ملـغە؛ بـاری؛ لۆسە؛ میلە یـان چێـوێکی بـەرز و پتـەو کـە لـە جێیەکدا سەقامی دەدەن و شتی قورس و گرانی پێ لادەدەن ▭ اهرُم

**مەڵقین / mełqîn**/: چاوگ. ڕزینی میوە بـە دارەوە ▭ پوک شدن میوه بر درخت

**مەڵکەمۆت / mełkemot**/: ☜ مەلکەمۆت

**مەڵکەنی / mełkenî**/: نـاو. مەڕکانـە؛ کووپەڵـەی دەم گوشاد ‹دروس کا بۆمان بە دەس‌وفەنی/ گـۆزە و گۆزەڵـە و دۆڵـە و مەڵـکەنی «حـەق‌شـناس»› ▭ خُمچه‌ی دهن گشاد

**مەڵلا / mełła**/: ☜ مەلا

**مەڵلایەتی / mełłayetî**/: ناو. ١. ☜ مەلایەتی ٢. بارودۆخی لە سەروو هەمووانەوە بـوون ▭ ١. ☜ مەلایەتی ٢. اولویت

**مەڵوەن / mełwen**/: ☜ مەڵبەند

**مەڵۆ / meło**/: ناو. مەلو؛ مـەلۆ؛ ملـۆ؛ مـەلۆک: ١. لـۆدەی دەخڵـی درواو ٢. پـڕی باوەشـێک لـە دەخڵی دووراو ٣. بەشێک لە سێ بەشی باقە لـە درەوکراو ▭ ١. توده‌ی علوفـه و غلـه‌ی دروشـده ٢. یک آغوش غله‌ی دروشده ٣. یک سوم بسته از غله‌ی درویده

**مەڵۆسەر / mełoser**/: ناو. ملۆسەر؛ دارێکی ساف و لووس و درێژ و نووک‌تیـژ بـە گرێیـەک لـە لای خواریەوە کە مەڵۆی پێوە دەکەن و دەیگوێزنـەوە بـۆ سـەر خـەرمان ▭ چـوبی دراز بـرای گـردآوری توده‌های درویده

**مەڵۆشەوێنکە / mełoşewênke**/: ناوەلـناو. [کینایـە] مەڵۆشێوێن؛ کارتێکدەر ▭ کاربه‌هم‌زن

**مەڵۆشێوێن[١] / mełoşêwên**/: نـاو. گیایەکە لـە نێـو گەنمدا ناهێڵێ سواڵە و مەڵۆ پێکەوە بنووسـێ ▭ گیاهی است

**مەڵۆشێوێن[٢]**: ☜ مەڵۆشەوێنکە

**مەڵۆکێش / mełokêş**/: نـاو. کەسـێ کـە کڵـۆش دەباتە سەر خۆیان ▭ آنکه غلـه‌ی دروشـده را سـر خرمن می‌برد

**مەڵوییە / mełûye**/: ناو. کولە؛ مەلەکوڕ ▭ ملخ

**مەڵەغان / mełeğan**/: ☜ ماڵەغان

**مەڵەق / mełeq**/: ☜ مەڵاق

**مەڵەما / mełema**/: ناوەلـناو. شـیلەوگەرم؛ شـەلۆ؛ شیرتێن ▭ ولرم

**مەڵهەم / mełhem**/: نـاو. مەرهەم؛ مەلەم؛ مەلهەم؛ هەتوان ‹تەشـەنا بۆتـەوە ناسـۆری دەروونم دیسـان/ زامی کۆنە و بـە مـەیی کـۆنی دەبـێ مەڵـهەم کـەم «هێمن»› ▭ مرهم

**مەم / mem**/: ☜ مەمك

**مەماڵ / memał**/: ناوەلناو. شـیردار؛ تایبەتمەنـدی ئەو گیاندارانەی مەمکیان هەیە و شیر بـە بێچـوو دەدەن ▭ پستاندار

**مەمرەمـەژی / memremejî**/: نـاو. ١. ژیـــانی بێچارەیی ٢. نەخۆشی لە نێوان مەرگ و ژیـدا ▭ ١. زندگی فلاکت بار ٢. حالت بین مرگ و زندگی

**مەمک / mem(i)k**/: نـاو. مـەم؛ مەمکـە؛ مـەمڵ؛ مەمڵە؛ مەمە؛ ئەنـدامێکی گیانـەوەرانی گوانـدارە شیرە تێدا بەرهەم دێ و کۆ دەبێتەوە ‹بۆ مـەمک نالی چ مندالانە وەی-وەی کردووە/ گـەرچی مـووی وەک شیرە، بەو شیرە شکۆفەی کردووە «نـالی»› ▭ پستان

▣ **مەمک خواردن**: مەمکە خواردن؛ شیر لە مـەمک مژین ▭ شیر از پستان خوردن

**مەمک خڕ کردن**: ☜ مەمك کردن

**مەمک (پێ)دان**: مەمکـە دان؛ مـەمک خسـتنە دەم؛ شیر دان بە منال ▭ شیر از پستان به بچـه

دادن

**مەمک دانان:** ☜ **مەمك کردن**

**مەمک کردن:** مەمک خڕ کردن؛ مەمک دانان؛ مەمکە کردن؛ تازە خڕ بوونی مەمک ⇐ پستان برآمدن

**مەمکبەل** / mem(i)kbel/: ئاوەڵناو. مەمکقیت؛ مەمکەقوت ⇐ پستان‌برجستە

**مەمکبەند** / mem(i)kbend/: ☜ **مەمکەبەند**

**مەمکخۆر** / mem(i)kxor/: ☜ **مەمکەخۆرە**

**مەمکخۆرە** / mem(i)kxore/: ☜ **مەمکەخۆرە**

**مەمکدار** / mem(i)kdar/: ناو. گواندار؛ گوهاندار؛ بەگوان؛ گیانداری کە گوانی هەیە ⇐ پستاندار

**مەمکدەر** / mem(i)kder/: ئاوەڵناو. بەشیر؛ تایبەتمەندی ژنێ کە شیری لە مەمکدایە ⇐ شیردە (زن)

**مەمکشووژن** / mem(i)kşûjin/: ئاوەڵناو. خاوەنی گۆی مەمکی زۆر قیت ⇐ دارای نُک پستان برجستە

**مەمکقیت** / mem(i)kqît/: ☜ **مەملکبەل**

**مەمککولی** / mem(i)kkulî/: ناو. ئێش و ژانی مەمک ⇐ درد پستان

**مەمکمژ** / mem(i)kmij/: ناو. بێچووی شیرخۆر ⇐ کودک شیرخوار

**مەمکمژە** / memikm(i)je/: ☜ **مەمکەمژە**

**مەمکۆڵە** / memkoɫe/: ناو. مەمۆ؛ مەمەڵە؛ مەمکی پچکۆلە ⇐ پستان کوچک

**مەمکە** / memke/: ناو. ١. ☜ **مەمك** ٢. ☜ **مەمکەمژە** ٣. دوو دەنکی جیاواز لە ناو تەزبێحدا ٤. هەر قیتێکی خڕی بچکۆلە ⇐ ١. ☜ **مەمك** ٢. ☜ **مەمکەمژە** ٣. دو مُهرەی متفاوت در رشتەی تسبیح ۴. هر برآمدگی گرد کوچک

**مەمکەبەند** / memkebend/: ناو. مەمکبەند؛ مەمکەلبەست؛ بەردلک؛ سووتیان؛ شاماکی؛ پارچەیێ درواو کە مەمکی پێ دەبەستن ⇐ پستان‌بند؛ کُرسِت

**مەمکەخۆرە** / memkexore/: ئاوەڵناو. مەمکخۆر؛ مەمکخۆرە؛ منداڵی شیرەخۆرە ⇐ شیرخوارە

**مەمکەقوت** / memkequt/: ئاوەڵناو. *[شووورەیی]* مەمکبەل؛ مەمکقیت ⇐ پستان‌برجستە

**مەمکەکیژە** / memkekîje/: ناو. گوڵێکی سپی و کورتەباڵای بێ‌گەڵایە، پاییزان دەڕوێ ⇐ نسترن پاییزی

**مەمکەڵبەست** / memkeɫbest/: ☜ **مەمکەبەند**

**مەمکەمژ** / memkemij/: ☜ **مەمکەمژە**

**مەمکەمژە** / memkem(i)je/: ناو. مەمکمژ؛ مەمکمژە؛ مەمکەمژ؛ مەمکە؛ مەملە؛ مەمۆڵە؛ پارچە پلاستیکێ لە شێوەی گۆی مەمک کە منالی پێ دەخافڵێ ⇐ پستانک

**مەملەکەت** / memleket/: ناو. وڵات ⇐ مملکت

**مەمڵ** / mem(i)ɫ/: ☜ **مەمك**

**مەمڵە** / memɫe/: ناو. ١. ☜ **مەمك** ٢. ☜ **مەمکەمژە**

**مەمڵەدەمێ** / memɫedemê/: ئاوەڵناو. مەمکەخۆرە ⇐ شیرخوارە

**مەمنا** / memna/: ئامراز. تۆ مەڵێ؛ تمەز؛ تومەز؛ تومەس مەکە ⇐ تو نگو؛ نگو کە

**مەمنوون** / memnûn/: ئاوەڵناو. منەتبار؛ منەتکار؛ سوپاسگوزار ⇐ سپاسگزار

**مەمۆ** / memo/: ☜ **مەمکۆڵە**

**مەمۆژن** / memojin/: ☜ **مامۆژن**

**مەمۆڵە** / memoɫe/: ☜ **مەمکەمژە**

**مەمە** / meme/: ☜ **مەمك**

**مەمەبەند** / memebend/: ☜ **مەمکەبەند**

**مەمەر** / memer/: ناو. ١. ☜ **مینبەر** ٢. هۆ؛ سۆنگە؛ بۆنە ‹ئەم هاتنیە بەم نیوەشەوە، بێ مەمەر نییە› ⇐ ١. ☜ **مینبەر** ٢. سبب

**مەمەڵە** / memeɫe/: ☜ **مەمکۆڵە**

**مەمینە** / memîne/: ناو. عەنتەر؛ حەنتەر؛ قونسوور ☰ عنتر

**مەن**[1] / men/: ناو. مـن؛ کێشـێکی کـۆنی ئێـرانی بەرانبەر بە سێ کیلۆ ☰ مَن

**مەن**[2]: ☜ **مەند**[2]

**ـ مەن**[3]: پاشگر. خـاوەن؛ خێـو ‹ئارەزوومـەن؛ دەوڵەمەن› ☰ ـ مند

**مەنارە** / menare/: ☜ **منارە**

**مەناوەمەن** / menawmen/: ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. تـەواو قەدەخە؛ قاخە ☰ اکیداً ممنوع

**مەنای** / menay/: چاوگ. مان ☰ ماندن

**مەنایرە** / menayre/: چاوگ. دامان ☰ واماندن

**مەنایوە** / menaywe/: چاوگ. مانەوە ☰ ماندن

**مەنتش** / mentiş/: ناو. دۆخی بردنەوە لە گرێـو ☰ بُرد در شرطبندی

**مەنتۆ** / mento/: ناو. پارچەیەکی قەدیمی ژنانەیـە ☰ پارچەای قدیمی زنانه

**مەنتەشا** / menteşa/: نـاو. مەنتەشـە؛ متەشـا ☰ چوبدست درویشان

**مەنتەشە** / menteşe/: ☜ **مەنتەشا**

**مەنجکی** / menc(i)kî/: نـاو. جـۆرێ گەنمـە بـۆ هەڕشتە دەبێ ☰ نوعی گندم

**مەنجوخ** / mencux/: ناو. ١. سسلە و پپلە ٢. گۆی سەر داری ئالا ☰ ١. منجوق ٢. قُبەی چوب پرچم

**مەنجەڵ** / menceɫ/: ناو. مەنجێل؛ بەرۆش ☰ دیگ مسی

**مەنجەڵۆک** / menceɫok/: ☜ **مەنجەڵۆکە**

**مەنجەڵۆکە** / menceɫoke/: نـاو. مەنجەڵـۆک: ١. مەنجەڵـی گچکـە ‹مەنجـەڵ بوونـە مەنجەڵـۆکە، ئاغاژن بوونە جنۆکە «مەسەل»› ٢. بەری گیایەکـە دەنکی وردی تێدایە ☰ ١. دیـگ کوچـک ٢. ثمـر گیاهی است

**مەنجەڵەکسێ** / menceɫek(i)sê/: نـاو. یارییـەکی منداڵانەیە، چەند کەس دەستی یەکتر دەگـرن و لـە جەغزێکـدا هەڵدەسـووڕێن ☰ از بـازیهـای کودکانه

**مەنجەنیق** / menceniq/: نـاو. ١. ئـامرازی ئـاگر هاویشتنە قەڵا لە شەڕدا ٢. /کینایە/ تەوژمی گەرما ☰ ١. منجنیق ٢. شدت گرما

**مەنجی** / mencî/: ناو. ناوبژی؛ نێوبژی؛ کەسێ کـە تێدەکۆشـێ دوو دژ ئاشـت کاتـەوە و شـەڕ و کێشەیان داکوژێنێ ☰ میانجی

**مەنجێڵ** / mencêɫ/: ☜ **مەنجەڵ**

**مەند**[1] / mend/: نـاو. ١. ☜ **مەندێ** ٢. لەشی مرۆ ٣. کاریتە؛ ڕاژە ☰ ١. ☜ **مەندێ** ٢. جثه ٣. تیرگ چوبی بزرگ

**مەند**[2]: ئاوەڵناو. مەن: ١. ڕاوەسـتاوی بـێ بـزووتن ‹ئاسمانی ساو و دەریای مەند و تارمایی چیا/ سـێوی لاسوور و بەهێی زەرد و هەناری گوڵبەدەم «هێمن»› ٢. /کینایە/ سەنگین و پشوولەسەرخۆ ☰ ١. راکد ٢. باوقار

**ـ مەند**[3]: پاشگر. خاوەن ‹هونەرمەند؛ بەهرەمەنـد› ☰ ـ مند؛ دارنده

**مەنداڤ** / mendav/: ☜ **مەنداو**

**مەندال** / mendal/: ☜ **مندال**

**مەنداڵ** / mendaɫ/: ☜ **منداڵ**

**مەنداو** / mendaw/: ناو. مەنداڤ؛ ئـاوی ڕاوەسـتاو ☰ آب راکد

**مەندش** / mendiş/: چـاوگ. وێچوون؛ وێکچوون ☰ شباهت داشتن؛ ماندن

**مەندک** / mendik/: ☜ **مەندێ**

**مەندۆخ** / mendox/: ئاوەڵناو. مەندەنی؛ مەندەنـە؛ بەردەوام؛ بەدەوام ☰ ماندگار

**مەندۆک** / mendok/: ☜ **مەندێ**

**مەندۆل** / mendol/: نـاو. باندۆل؛ فەنەری سـەعات

ﷺ پاندول ساعت

**مەندۆڵـە / mendołe**/: نـاو. مەنگۆڵــە: ١. گـــۆی زێڕی وەک گوڵـینگە ٢. پارچەیـەکی جوانـە بـۆ بەرگی ژنان ﷺ ١. منگولەی زرین ٢. نوعی پارچەی زنانە

**مەندوونە / mendûne**/: ناو. مەدوونـە؛ خاکـەنازی سۆبە ﷺ خاک‌انداز بُخاری

**مەندە / mende**/: ناو. ١. مەننە؛ مەنـە؛ باقیمـاو ٢. ناوی نامەعلووم ‹شەندە لە مەندە کەمتر نییە› ﷺ ١. باقیماندە ٢. زید نام نامشخص

**مەندەبۆر / mendebor**/: ناوەڵناو. *[پلار]* مەنـدەبوور؛ زەلامی ڕەزاتاڵ ‹دەسبەندیانە، دێن و دەچن سـەرو و نارومن/ یا حەلقەیانە سۆفی مل‌خـوار و مەنـدەبۆر؟ «نالی»› ﷺ گُندەبک

**مەندەبـوور / mendebûr**/: ناوەڵـناو. ١. بـێ‌بــزاو؛ جووڵەلێبڕاو (وەک: لاشە) ٢. ☜ **مەندەبۆر** ﷺ ١. بی‌حرکت افتادە ٢. ☜ **مەندەبۆر**

**مەندەر / mender**/: ناو. دوشەکۆڵە ﷺ تُشکچە

**مەندەروونە / menderûne**/: ناو. بانگێڕ؛ باگردێن ﷺ بام‌غلتان

**مەندەفە / mendefe**/: نـاو. سـەر و پێچـی زل ﷺ دستار بزرگ

**مەنـدەلفیوم / mendelifyum**/: نـاو. تـــوخمی شیمیایی کانزایی لە دەستەی ئاکتنیـدەکان، بـە ژمارەی ئەتومی ١٠١، کە بـە شـێوەی دەسـکرد بەرهەم دێت ﷺ مندلفیم

**مەندەلی / mendelî**/: نـاو. جـۆرێ تـرێ ﷺ نـوعی انگور

**مەندەنە / mendene**/: ☜ **مەندۆخ**

**مەندەنی / mendenî**/: ☜ **مەندۆخ**

**مەندەی / mendey**/: ☜ **مەنەی**

**مەنـدی / mendî**/: نـاو. مــەنگی: ١. چۆنیـــەتی داوەســتان و خــوڕ نــەبوونی شــتی بــزۆک ٢. سەنگینی و لەسەرخۆیی ‹ خەتت هێنا، جەمالت چا نەما، کوا ڕەونەقی خاڵت؟/ فەڕەنگی هات.و کەعبـەی گرت و مەندی چوو لە شـاری تـۆ «وەفـایی»› ﷺ ١. رکود (سیّال) ٢. وقار

**مەنـدیل / mendîl**/: ناو. ١. شاشک؛ پێچی سەر ٢. دەسەسڕ ﷺ ١. دستار ٢. دستمال

**مەندێ / mendê**/: نـاو. مەند؛ مەنـدک؛ مەنـدۆک؛ مەنی؛ مەنێ؛ گیایەکی کوێستانە دەگـەڵ ژاژی و پەنیر دەکرێ ﷺ گیاهی است

**مەنزڵ / menził**/: ناو. مزل؛ مەنزەل؛ مـەنزیل: ١. ماڵ؛ خـانوو یانـە؛ خانـک؛ شـوێنی تێـدا ژیـان و حەسانەوە ‹پەین و پالێ کە لە پالی دیپـە/ مەنزلـی نۆکەری خۆتی لنیە «سوارە»› ٢. ئۆدەی فەرشکراو بۆ بە کرێ دان ‹زۆرتری وەختم لە قەلادزە ڕادەبرد. دەگەڵ مسـتەفا و کـاوە ببوومـە هاومـەنزل. خـاوەن مەنزلەکە ناوی ئەحمەد هەرمێ بوو «هەژار، چێشـتی مجێور»› ٣. یەکەی کۆنی ڕێگا، ئەوەندەی شەش فرســەخ، ڕۆژە ڕێیــەکی کــاروان ٤. جێگــەی سانەوەی کـاروان ٥. *[مەجاز]* بـەر؛ وەر؛ مەقسـەد ‹خەلکی گەییشتە مەنزل و گشت ئێستە سەربەخۆن/ هەر کوردە مایەوە لە هەوارێکی چاڵ و کۆن «ڕەمـزی سلێمانی»› ٦. *[کینایە]* قەور؛ قەبر؛ گـۆڕ ‹سـێبەری مەرگم لە پێشدایە و بەرەو مەنزڵ دەڕۆم/ ناخی گۆڕی تەنگە جێگام، هەر تل‌ئاسا بـێ قـەدەم «هـێمن»› ٧. *[مەجاز]* ماڵی پاش مەرگ ‹جـە سـەر ملـەی کـۆی فەنا ویەردە/ مەنزل وە تاقچـەی ڕەزای حـەق بـەردە «مـەلا سـەلاحەددینی پـاوە»› ﷺ ١. خانـە ٢. اتـاق مفروش کرایەای ٣تا٥. منزل ۶. گور ۷. خانەی آخرت

**مـەنزڵگا / menziłga**/: نـاو. مزڵــگە؛ مەنزڵـــگە؛ جێگەی شەو لێ‌مانەوەی کاروان و ... ‹ئـەوڕۆ تـا ئێوار وە چەنـد دەردیســەر/ شـەو مەنزڵـگامان بی وە ڕوانسەر «ئاغا عینایەت»› ﷺ منزلگە

**مەنزڵگە / menziłge**/: ☜ **مەنزڵگا**

**مەنزەل / menzel/:** ☜ **مەنزڵ**

**مەنزیل / menzîl/:** ☜ **مەنزڵ**

**مەنسوری / mensûrî/:** ناو. قامێکە ☰ آهنگی است

**مەنڤاڵ / menval/:** ☜ **مەنقەڵ**

**مەنقەلی / menqalî/:** ☜ **مەنقەڵ**

**مەنقەڵ / menqeł/:** ناو. مانقال؛ مەقەلی؛ مەنڤـاڵ؛ مەنقەلە؛ مەنقەلی؛ مەنقـەلی؛ مقەلـی؛ مەنگـەڵ؛ مەنگەلی؛ مەنگەلیە؛ دەفری سکل تێکـردنی لـە کانزا ☰ منقل

**مەنقەلە / menqełe/:** ☜ **مەنقەڵ**

**مەنقەلی / menqełî/:** ☜ **مەنقەڵ**

**مەنگ / meng/:** ئاوەڵناو. ١. گێژ؛ گـێج؛ وڕ؛ کـاس؛ تووشیاری ئاڵۆزی و شێواوی هزر و بیر ٢. مەنـد؛ مەن؛ ڕاوەستاو ☰ ١. گیج؛ منگ ٢. راکد

**مـەنگری / meng(i)rî/:** نـاو. سـینی گـەورە؛ مەعجۆمەی زل؛ لەنگەری ☰ سینی بزرگ

**مەنگوڵ / menguł/:** ناو. چۆک؛ زرانی؛ ئەژنۆ ☰ زانو

**مەنگۆڕ / mengoř/:** نـاو. قەیرەکچی شوو نـەکردوو ☰ پیردختر

**مەنگۆز / mengoz/:** ئاوەڵـناو. سپلـە؛ پـێنـەزان ☰ نمک‌نشناس

**مەنگۆڵ / mengoł/:** ☜ **مەنگۆڵە ـ٢**

**مەنگۆڵـە / mengołe/:** نـاو. ١. ☜ **مـەندۆڵـە** ٢. مەنگۆڵ؛ مەنهۆڵ؛ پارچە بتوونێکی خڕی گرۆڤـەر بۆ ڕەهەندی فازڵاو کە هاموشۆی پێدا دەکەن ☰ ١. ☜ **مەندۆڵە** ٢. منهُل فاضلاب

**مەنگەڵ / mengeł/:** ☜ **مەنقەڵ**

**مەنگـەڵـە / mengełe/:** نـاو. مەنگەلـی؛ یەکـەی دراوی هیندوستان ☰ واحد پول هندی

**مەنگەڵی / mengełî/:** ناو. ١. ☜ **مەنقەڵ** ٢. ☜ **مەنگەڵە**

**مەنگەڵیە / mengełye/:** ☜ **مەنقەڵ**

**مەنگەن / mengen/:** ☜ **مەنگەنە**

**مەنگەنە / mengene/:** ناو. مەنگـەن: ١. گـیرە ٢. دەزگای لێدانی گیرە ☰ ١و٢. منگنه

**مەنگەنیز / mangenîz/:** ناو. توخمی شیمیایی بـە ژمـارەی ئـەتومی ٢٥ و کێشـی ئـەتومی ٥٤،٩٣، کانزایەکی نەرم و تورت و بە ڕەنگی سپی مەیلەو بۆرە کـە لـە ئەسـیددا دەتوێتـەوە و بـۆ بەرهـەم هێنانی ئالیاژ کەڵکی لێ دەگرن ☰ منگنز

**مەنگی / mengî/:** ☜ **مەندی**

**مەننە / menne/:** ☜ **مەندە ـ١**

**مەنۆڵـە / menołe/:** نـاو. پارچـەی مەندۆڵـە ☰ پارچه‌ای است

**مەنـونی / menûnî/:** نـاو. بۆتـەی کـانزا تێـدا تواندنەوە ☰ بوته‌ی ریخته‌گری

**مەنـونێ / menûnê/:** لـێل. وتەیـەکی بـێ واتـای جادووگەرانەیە (هەنوونێ، مەنوونێ) ☰ کلمه‌ای بی معنی در جادوگری (مانند: هَجّی، مَجّی)

**مەنە[١] / mene/:** ☜ **مەندە ـ١**

**مەنە[٢]:** ☜ **ماندو**

**ـ مەنە[٣]:** پاشەوشە. ١. ماوەوە لە کاتدا (شەومەنە) ٢. ماوەوە لە شوێندا (بەزمەنە) ☰ ١و٢. مانده

**مەنەر / mener/:** ناو. ١. مان؛ گە ٢. شـوێنەوار ٣. دۆخی ڕاوەستان بـە شـلی و سسـتی ٤. دەمـار؛ دەعیە ☰ ١. اعتصاب ٢. اثر ٣. حالت شُل ایستادن ۴. تکبُر

**مەنەرەی / menerey/:** چاوگ. دامان ☰ واماندن

**مەنەری / menerî/:** ئاوەڵناو. بە فیـز؛ بـایی‌هـەوا ☰ خودخواه

**مەنەک / menek/:** ناو. ڕکێف ☰ رکاب زین

**مەنـەوشە / menewşe/:** نـاو. گوڵـە وەنەوشـە ☰ بنفشه

**مەنەوەشە / meneweşe/:** نـاو. وەنەوشە؛ وەنـەوش ☰ بنفشه

**مەنەی / meney/:** چاوگ. مان؛ مەندەی ☰ ماندن

**مەنی**[1] / menî/: ناو. ١. گومان؛ خەیاڵ؛ ڕاوێژ ٢. ☜ **مەندێ** ٣. سەنگی کێشانی مەن ٤. شاوەت؛ ئاوی پشت ☲ ١. گمان ٢. ☜ **مەندێ** ٣. سنگ یک منی ۴. مَنی

**مەنی**[2]: ئاوەڵکار. بە مەن ‹نیسک مەنی ئەفرۆشن› ☲ منی

**مەنیسە** / menîse/: ناو. ڕەنگی دەفری سواڵەت ☲ رنگ ظروف سفالی

**مەنین** / menîn/: چاوگ. مان ‹ماڵ باباد برمێ چتەو مەنیدە/ بەهەشت فرووتی دووزەق سەنیدە «فولکلۆر»› ☲ ماندن

**مەنیەزیوم** / menyezyum/: ناو. توخمی شیمیایی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ١٢ و کێشی ئەتومی ٢٤,٣٠، بە ڕەنگی سپی زیوکار، کە لە ئاودا ناتوێتەوە و بە ڕووناکایی زۆرەوە گڕ دەگرێ، خوێی مەنیەزیوم بە زۆری لە ئاوی دەریادا هەیە و لە بەرهەم هێنانی ئالیاژگەلی سووک، پاکژکردنەوەی شەکر، دەواسازی، وێنەگری و شیشەسازیدا بە کەڵک دێت ☲ منیزیم

**مەنێ** / menê/: ☜ **مەندێ**

**مەو** / mew/: ☜ **مێو-٣**

**مەوار** / mewar/: ئاوەڵناو. دەڵەمە ☲ دَلَمه

**مەواژ** / mewaj/: ئامراز. مەواژەکە؛ تۆمەز؛ تمەز؛ تمەس؛ مەک ☲ تو نگو

**مەواژەکە** / mewajeke/: ☜ **مەواژ**

**مەواڵ** / mewal/: ☜ **مەباڵ**

**مەوبەت** / mewbet/: ☜ **مۆقەت**

**مەوت** / mewt/: ناو. مناڵ ترسێنی خەیاڵی ☲ لولوخرخره

**مەوتەن** / mewten/: ناو. مەڵبەندی تێدا ژیان ‹ئەی هەژار! بەسیەتی مردن، هەستە!/ مژدە بێ، مەوتەنەکەت سەربەستە «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☲ موطن

**مەوج** / mewc/: ناو. ١. جاجم ٢. مۆنجی کر و پارچە ٣. شەپۆل ☲ ١. جاجیم ٢. موج در پارچە ٣. موج

**مەوجو** / mewcû/: ☜ **مەوجود**

**مەوجود**[1] / mewcûd/: ناو. مەوجوو؛ بوونەوەر ☲ موجود

**مەوجود**[2]: ئاوەڵناو. مەوجوو؛ هەبوو؛ خاوەنی بوون ☲ موجود

**مەوجی** / mewcî/: ئاوەڵناو. ١. وەبەر شەپۆلی تەقینەوە کەوتوو ٢. *[کینایە]* ئاڵۆزاو؛ تێکچوو ☲ ١و٢. موجی

**مەودا** / mewda/: ناو. ١. لێواری تیخ ‹تۆخوا وێت‌ئاسا باوەڕەش وەبەر/ وە مەودای ئەبرووت پارەپارەش کەر «میرزا عەبدولقادری پاوە»› ٢. نووکی شتی تیژ (وەک: خەنجەر و شمشێر و ...) ‹مەودای موژانش نشتەن نە جەرگم/ یە هوون دڵەن پێی ڕەژیان بەرگم «بێسارانی»› ٣. نێوان؛ ماوەی بەینی دوو شت یان دوو شوێن ‹سبەی کە وەڕێ کەوتین تووشی شیوە پەڵەیەکی پڕ بەفر بووین کە مەودای بیست میتر نەدەبوو. پلەکانی لێ پکە! کەوش داکەنە! بە نیو سەعات بە قیرە دەرچووین! «هەژار، *چێشتی مجێور*»› ٤. مۆڵەت؛ قانە ‹گەلێکم ڕۆژگاری تاڵ و شیرین ڕابوارد، ئاخۆ/ مەرگ مەودا دەدا دیسان ببینم سەردەمێکی تر! «هێمن»› ٥. ماوە؛ سەردەمێ لە کات و سات ‹قەولی دا ... چاپخانەیەک تەرخان بکا بۆ کوردی چاپ کردن. بەڵام مەودا نەما تا بزانین دەیکا یان نا... «هەژار، *چێشتی مجێور*»› ☲ ١. لبەی تیغ ٢. نُک شیئ تیز ٣. مسافت ۴. مُهلت ۵. مدت؛ بخشی از زمان

**مەورانی** / mewranî/: ☜ **مەگیرانی**

**مەورد** / mewrid/: ناو. ١. مەبەست ٢. جار ☲ ١. موضوع ٢. بار؛ دفعه

**مەورە** / mewre/: ناو. ١. ☜ **مرمەند** ٢. ☜

**مێژەڵۆك**

**مەورەت** / mewret/: ☜ **مرمەند**

**مەورەد** / mewred/: ☜ **مرمەند**

**مەوریان** / mewiryan/: ☜ **مەگیرانی**

**مەوز** / mewz/: ☜ **مۆز ـ٢**

**مەوژ** / mewj/: ناو. تـەرز؛ تـەحر؛ بـیچم؛ جـۆر ☰ طرح؛ شکل

**مەوژ** / mewij/: ناو. ١. مەویژ ٢. میاوی پشیلە ☰ ١. مویز ٢. میو گربە

**مەوژاندن** / mewjandin/: چاوگ. میاواندنی پشیلە ☰ میو کردن گربە

**مەوژۆک** / mewjok/: ناو. گیایـەکی بنـدارە و تـام شیرین ☰ گیاهی با پیاز خوردنی

**مەوس** / mews/: ☜ **ماوس**

**مەوق** / mewq/: ناو. ١. شوێن؛ جێگە ٢. دەوروبەر ☰ ١. جای ٢. حوالی

**مەوقوفە** / mewqûfe/: ناوەڵناو. ملکی تایبەت‌دراو بە کارێ یان مەزرینگەیێ ☰ موقوفە

**مەولو** / mewlû/: ناو. مـەولوود: ١. مانگـێ کـە پێغەمبەری تێدا لـە دایـک بـووە ٢. مـەولوویی؛ جێژنی چێشت و نان بەخشـینەوە بـە هـۆی لـە دایک بوونی پێغەمبەرەوە ☰ ١. ماه ربیـع‌الاول ٢. اطعام بە مناسبت میلاد پیغمبر

**مەولود** / mewlûd/: ☜ **مەولو**

**مەولودنامە** / mewlûdname/: نـاو. مەوڵوونامـە؛ ئاهەنگ و سروودێکی ئایینی بە بۆنەی جێژنی لـە دایک بوونی پێغەمبـەری ئیسـلام و لـە پەسـنی ئەودا ☰ مولودنامە

**مەولـودەمانگ** / mewlûdemang/: نـاو. مـانگی مەولوو ☰ ماە ربیع‌الاول

**مەولـودی** / mewlûdî/: نـاو. مـەولوویی؛ رێورەسمێـک بـۆ جێـژنی لـە دایـک بـوونی پێغەمبەری ئیسلام بە خوێنـدنی مەولوودنامـە ☰ مولودی

**مەولونامە** / mewlûname/: ☜ **مەولودنامە**

**مەولویی** / mewlûyî/: ناو. ١. ☜ **مـەولـودی** ٢. ☜ **مەولوـ٢**

**مەولەق** / mewleq/: ☜ **مۆلەق**

**مەولـەوی** / mewlewî/: نـاو. سـەرناوێکی خوێندەوارانی ئایینیە ☰ از القاب روحانیون

**مەووژ** / mewuj/: ☜ **مێوژ**

**مەوەرد** / mewerd/: ناو. بڕبەنـد؛ مرمەنـد؛ بڕبـەن؛ بڕوەن ☰ سوهان

**مەویژ** / mewîj/: ☜ **مێوژ**

**مەھ** / meh/: ناو. ١. *[ئەدەبی]* مانگ ‹وەک شەو کشا بە سەر مەهی ڕوخساریا خەتی/ گیرا ئەم ئافتابە کـە قەت بەرنەبێتەوە «مەحوی»› ٢. مـانگی سـی ڕۆژە ٣. هەڵـدێر؛ هەڵـەت؛ جێگـەی بـەرز و ڕژد کـە مەترسی بەربوونەوەی زۆرە ‹مەهی هەزار بە هەزار/ بە یەک گڤەی بـەرەوخوار/ ئەبـرم لـە ترسـی زۆردار/ قەقبە قەقبە قەقبە، قەق «گۆران»› ٤. پەز؛ مـەڕ ☰ ١. ماە ٢. بدر ٣. پرتگاە ۴. گوسفند

**مەھا** / meha/: ناو. پەز؛ مەھ؛ مەڕ ☰ گوسفند

**مەھار** / mehar/: ناو. مهار: ١. ئاڵـقە و پـەتێ کـە دەخرێتـە لـووتی وشـترەوە ٢. کـاری ڕاگـرتن و بەڕێوە بردنی کەرستەی بزۆک ☰ ١و٢. مهار

◘ **مەھار کردن**: ١. پەت و ئاڵقە دەلووت خسـتنی حوشتر ٢. تەمراندن؛ دامرکاندن؛ ڕاگیر کردن؛ بەرگرتن ☰ ١و٢. مهار کردن

**مەھاربەن** / meharben/: نـاو. بەھاربەنـد؛ پەچـە؛ تەوێڵەی سەرنەگیراو بۆ یەکسم ☰ بهاربند

**مەھارەت** / meharet/: نـاو. کارامـەیی؛ لێـزانی؛ شارەزایی لە کار ☰ مهارت

**مەھان** / mehan/: نـاو. دەخشـتە؛ دەشـتان ☰ قاعدگی

**مەھانی** / mehanî/: ☜ **مانگانە**

**مەهبرن** / mehb(i)rin/: ناو. مانگی مەگیرانی کردن 🇮🇷 ماه ویار کردن حامله

**مەهبەرە** / mehbere/: ناو. زبارە؛ هەرەوەز؛ گەلەکۆمەگی (کار) 🇮🇷 تعاونی (کار)

**مەهبیران** / mehbîran/: ☜ **مەگیرانی**

**مەهتاو** / mehtaw/: ☜ **مانگەشەو**[1]

**مەهتووک** / mehtûk/: ئاوەڵناو. خوێڕی؛ سووک؛ بێبایەخ 🇮🇷 بی‌ارزش

**مەهتەر** / mehter/: ☜ **مەیتەر**

**مەهجەت** / mehcet/: ناو. ئاتاجی؛ پێویست؛ پێداویست 🇮🇷 نیاز

**مەهدک** / mehdik/: ناو. دەرگوش؛ لانکە 🇮🇷 گهواره

**مەهدەر** / mehder/: ناو. تکا؛ ڕەجا؛ شفات 🇮🇷 شفاعت

**مەهدەرچی** / mehderçî/: ئاوەڵناو. تکاکار؛ ڕەجاکەر 🇮🇷 شفیع

**مەهدەرڤانی** / mehdervanî/: ناو. لالە؛ لاڤە؛ پاڕە 🇮🇷 لابه

**مەهر** / mehr/: ناو. ١. ☜ **مارە** ٢. مارەیی 🇮🇷 ١. ☜ **مارە** ٢. کابین

⊡ **مەهر کرن**: مارە کردن 🇮🇷 عقد کردن

**مەهس** / mehs/: ناو. پالا لە هەمانە؛ سووکە سۆڵ 🇮🇷 دمپایی

**مەهشۆت** / mehşot/: ناو. ماشۆت؛ کرمی نۆکی شین 🇮🇷 آفت نخود سبز

**مەهفوور** / mehfûr/: ☜ **مافوورە**

**مەهڤان** / mehvan/: ☜ **میوان**

**مەهک** / meh(i)k/: ناو. مەهکی؛ مەهیک؛ بێنوێژی؛ پیسار؛ پیار؛ عوزر؛ سووڕی مانگانە؛ خوێنی مانگانە؛ خولی ڕژانی خوێن لە ژن و بڕێ ئاژەڵی مێوینە، لە کاتی دوگیان نەبوونیاندا تا کاتێ ئاوەسوو دەبن 🇮🇷 قاعدگی

**مەهکی** / mehkî/: ☜ **مەهك**

**مەهگران** / mehg(i)ran/: ☜ **مەگیرانی**

**مەهل** / mehl/: ناو. گرانی؛ قاتی؛ قڕی 🇮🇷 قحطی

**مەهلا** / mehla/: ☜ **محەلە**

**مەهلان** / mehlan/: ناو. دەم؛ تاو؛ قان 🇮🇷 اندک زمان

**مەهلی** / mehlî/: ناو. ١. ☜ **مالۆ** ٢. کون ئاخنی گۆنجە لە پەڕۆ 🇮🇷 ١. ☜ **مالۆ** ٢. سوراخگیر آبراه

**مەهمێز** / mehmêz/: ☜ **مامزە**

**مەهن** / mehn/: ناو. ناز 🇮🇷 ناز

**مەهۆ** / meho/: ☜ **مالۆس**

**مەهووز** / mehûz/: ☜ **مافوورە**

**مەهەت** / mehet/: ناو. ئاریکاری؛ هاوقۆڵی؛ کۆمەک؛ یاریدە 🇮🇷 همکاری

**مەهەک** / mehek/: ناو. بێشکە؛ بێشک؛ لانک؛ لانکە 🇮🇷 گهواره

**مەهەیر** / meheyr/: ئاوەڵناو. هەژار؛ بێچارە؛ لێقەوماو 🇮🇷 بیچاره

**مەهی** / mehî/: ☜ **مانگانە**

**مەهیتی** / mehîtî/: ☜ **مانگانە**

**مەهیر** / mehîr/: ناو. مەیر؛ مەیری؛ میرهی؛ میرهێ؛ دۆکلیو؛ دۆخەوا؛ دۆخوا 🇮🇷 آش دوغبا

**مەهیک** / mehîk/: ☜ **مەهك**

**مەهین**[1] / mehîn/: ☜ **مەیین**

**مەهین**[2]: ☜ **مایین**

**مەهینکا** / mehînka/: ناو. تاژیلۆکە؛ حوشترخوا 🇮🇷 آخوندک

**مەهینی** / mehînî/: ناو. مەیا؛ ئێستری ماچە 🇮🇷 ماچه استر

**مەی** / mey/: ناو. ١. شەراو؛ بادە ‹بە مەی چارەی چلۆن دەکرێ دەروونی پڕ لە ناسۆرم/ خەساری بۆ دەکەی دوکتۆری زانا مەرهەمێکی‌تر؟ «هێمن»› ٢. مەزە؛ تامی لای شەراب ٣. مەھ؛ پەز؛ مەڕ 🇮🇷 ١. می ٢. مزه ٣. گوسفند

▣ **مەی گێڕان** گەڕاندن و بۆ تێکردنی مەی لە کۆڕدا 🇮🇷 می گرداندن

**مەیا**[1] / meya/: ناو. مەهێنی؛ ئێستری ماچە 🇮🇷 ماچە استر

**مەیا**[2]: ناوەڵناو. مەییو؛ بە هەوێن توندبوو 🇮🇷 بندآمده؛ مُنعقد

**مەیان**[1] / meyan/: ☜ **مەیین**

**مەیان**[2]: ناو. ١. ☜ **مەیدان** ٢. بەینی دوو شت ٣. جۆرێ ترێ ٤. هەویرترش 🇮🇷 ١. ☜ **مەیدان** ٢. میان ٣. نوعی انگور ۴. خمیرمایە

**مەیانبار** / meyanbar/: ناو. کۆگای بەرفراوانی میوە و تەڕەبار 🇮🇷 میدان بار

**مەیاندن** / meyandin/: چاوگ. ١. ئامیان لێ دان ٢. *[کینایە]* گرساندن؛ بەستن 🇮🇷 ١. مایە زدن ٢. بستن

**مەیانە** / meyane/: ناو. *[مەجازی]* بەین؛ پەیوەندی؛ ئاشنایەتی ‹ مەیانەمان خۆشە› 🇮🇷 میانە

**مەیب** / meyb/: ناو. مێو؛ بنی ڕەز؛ داری هەنگوور 🇮🇷 تاک؛ مَو

**مەیت** / meyt/: ناو. جەنازە؛ لاشەی مردوو 🇮🇷 جنازە

**مەیتەبا** / meyteba/: ناو. هەڵەپەزە؛ پەسپەسەکۆلە 🇮🇷 رُتیل

**مەیتەر** / meyter/: ناو. مهتەر؛ مەختەر؛ مەهتەر؛ سەیز؛ سیەس؛ ڕەڤیڤان؛ بەخێوکەری ئەسپ؛ خزمەتکار و ئاگاداری ئەسپ 🇮🇷 مهتر اسب

**مەیخانە** / meyxane/: ناو. مەیکەدە؛ شەرابخانە ‹ئێستە بۆ چاری خەمم گۆشەیی مەیخانەیە جێم/ من کە ڕۆژێ دەمەویست میللەتەکەم بێخەم کەم! «هێمن»› 🇮🇷 میخانە

**مەیخانەچی** / meyxaneçî/: ناو. شەراوفرۆش 🇮🇷 میفروش

**مەیخۆر** / meyxor/: ☜ **مەیخۆرەوە**

**مەیخۆرە** / meyxore/: ☜ **عارەقخۆر**

**مەیخۆرەوە** / meyxorewe/: ناوەڵناو. مەیخۆر؛ مەینۆش؛ شەرابخۆرەوە 🇮🇷 میگسار؛ میخوارە

**مەیخۆش** / meyxoş/: ناوەڵناو. مێخۆش؛ مزر؛ بەینی ترش و شیرن ‹هەناری خڕی مەیخۆش› 🇮🇷 ملس

**مەیخولی** / meyxûlî/: ☜ **ماخولیا**[1]

**مەیدان** / meydan/: ناو. مەیان: ١. فولکە؛ فەلەکە؛ ئاقارێکی خڕ لە بڕگەی چەن شەقامدا ‹مەیدانی چوارچرا› ٢. گۆڕەپان؛ تەختایی زەوی ٣. شەڕگە ‹هەر دەگەڵ تەقە قەوما ... هەر کەسە بوونە دزی گای خۆیان و غەیب بوون! حەفتا کەس ... نەبێ کە لە مەیدان چەقین و لە تاریکایی شەودا سەنگەریان چۆل نەکرد «هەژار، چێشتی مجێور»› ٤. دەفری مەی؛ هەرچی شەرابی تێ بکەن ‹تۆ باقییەیی ساقییەیی سەحنی چەمەن بە!/ مەیدان هەموو مەی دانە بە کاسات و بە تاسات «نالی»› 🇮🇷 ١. میدان ٢. زمینِ هموار ٣. آوردگاه ۴. ظرف می

▣ **مەیدانا بازێ** جێگەی ڕکە و ملە کردن 🇮🇷 میدان مسابقە

▣ **مەیدان نانەوە** ئامادەی شەڕ بوون لە مەیداندا 🇮🇷 آرایش جنگی گرفتن در میدان جنگ

**مەیدانبازی** / meydabazî/: ناو. مەیدانوازی: ١. ڕکە و ملە؛ گەمە و کایە لە مەیداندا ٢. یاری وا کە لە مەیداندا بکرێ 🇮🇷 ١. مسابقە در میدان ٢. بازی میدانی

**مەیدانداری** / meydandarî/: ناو. *[کینایە]* دۆخی بە دەستەوە بوونی کار و بار 🇮🇷 میدانداری

**مەیدانکێش** / meydankêş/: ناو. ئاسنێکی دەمپانە وەک درمەغ، دەسکی هەیە، گوڵ و خۆڵی مەیدانی خشتبێژانی پێ پاک دەکەنەوە 🇮🇷 وسیلەی خاکروبی محل خشتزنی

**مەیدانوازی** / meydanwazî/: ناو. ١. گۆڕەپانی گەمە ٢. ☜ **مەیدانبازی** 🇮🇷 ١. میدان بازی ٢.

☜ مەیدانبازی

**مەیدنۆز** / meyd(i)noz/: ☜ مەدەنۆس

**مەیر** / mey(i)r/: ☜ مەهیر

**مەیرە** / meyre/: ناو. پەنیر و لۆرکی تێکەڵاو ☰ از لبنیات

**مەیرەک** / meyrek/: ناو. کرمێکە مێملێی شیناوەردە ☰ حشرەای آفت سبزیجات

**مەیری** / mey(i)rî/: ☜ مەهیر

**مەیز** / meyz/: ناو. تماشا؛ نیگا ☰ نگاه

**مەیزاندن** / meyzandin/: چاوگ. مەیزین؛ تماشا کردن ☰ نگاه کردن

**مەیزەدە** / meyzede/: ناوەڵناو. ڕەشەمەس؛ مەستی کەلەلا ‹سۆفی گۆشەی خانەقا بووم، ئێستە پیری مەیکەدەم/ زاهیدی خەلوەنشین بووم، ئێستە مەست و مەیزەدەم «هێمن»› ☰ سیاەمست

**مەیزین** / meyzîn/: ☜ مەیزاندن

**مەیژدە** / meyijde/: ☜ مەجیدی ـ٢

**مەیس** / meys/: ☜ مێش ـ١

**مەیشت** / meyşt/: ناو/ ناوەڵکار. سۆزی؛ سبحەینێ؛ سبەی؛ بەیانی ☰ فردا

**مەیشنا** / meyşna/: ☜ مەڕ ـ١

**مەیفرۆش** / meyf(i)roş/: ناو. پیاڵەفرۆش؛ کەسێ کە ئارەق و شەراب بە وردە دەفرۆشێ ☰ می‌فروش

**مەیڤان** / meyvan/: ☜ میوان

**مەیڤی** / meyvî/: ناو. داری ترێ؛ مێو؛ بنی ڕەز ☰ مَو؛ تاک

**مەیکوت** / meykut/: ناو. کوتکی دارین ☰ پُتک چوبی

**مەیکەدە** / meykede/: ☜ مەیخانە

**مەیکێئاڤێ** / meykê'avê/: ☜ میائاڤێ

**مەیگو** / meygû/: ناو. ئەنگوش؛ کێچی دەریا؛ جۆرێ قرژاڵۆکەی دەپایە لە تیرەی ڕەق‌پێستان بە چنگاڵی درێژی دڕکاوییەوە ☰ میگو

**مەیگەر** / meyger/: ☜ مەیگێڕ

**مەیگەڕ** / meygeř/: ☜ مەیگێڕ

**مەیگێڕ** / meygêř/: ناو. مەیگەڕ؛ مەیگەر؛ ساقی؛ ئاودەر؛ کەسێ کە شەراب لە ناو شەراوخۆراندا دەگێڕێ ‹مەیگێڕ بە سەرت پردی سیراتیش کەڵەکە/ سەیرانی بەهەشت سەیری دوو چاوی بەڵەکە «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ☰ ساقی

**مەیل** / meyl/: ناو. ١. ئارەزوو؛ تاسە ‹وەش ئامای هەی پەیک لای قەبیلەی لەیل/ جەیب دڵ وە عەتر مەیل لەیلێ کەیل «مەولەوی»› ٢. خۆشەویستی ‹بۆ دەگەڵما مەیلی جارانت نییە؟› ٣. ویست؛ حەز؛ خوازە ‹تۆش ئەگەر مەیلت لێ بوو، وەرە!› ☰ ١. آرزو ٢. مَحبت ٣. میل؛ تمایل

⊡ **مەیل بون**: ☜ مەیل لە سەر بون

**مەیل تازە کردن/ کردنەوە**: سەرهەڵدانەوەی یاد و خۆشەویستییەکی کۆن ☰ فیل (کسی) یاد هندوستان کردن

**مەیل سارد بونەوە**: *[کینایە]* بێ‌مێهر بوون ☰ نامهربان شدن

**مەیلی شتێ/ کارێ هەبون**: تەما کردن؛ قەستی شتێ/ کارێ کردن ‹عاشقی بێ دڵ دەناڵێ، مەیلی گریانی هەیە/ بێ‌شکە، هەورەتریشقە، تاوی بارانی هەیە «نالی»› ☰ قصد چیزی/ کاری داشتن

**مەیل لە سەر بون**: مەیل بوون؛ ویستن؛ گەرەک بوون ‹با شەو بڕوا سەحەر بێ، باغی گوڵان وەبەر بێ/ گەر تۆ مەیلت لە سەر بێ، کافر ئیسلامی ناوە! «وەفایی»› ☰ خواستن؛ تمایل داشتن

**مەیل نان**: لە بیر بردنەوە ☰ از یاد بردن

**مەیلان** / meylan/: ناو. ئارەزوو؛ ئاوات ☰ آرزو

**مەیلدار** / meyldar/: ناوەڵناو. خوازیار ‹ئەگەر مەیلداری مەیل بدە پێمان/ ئەگەر بێ‌مەیلی بار کە لە دێمان «فولکلۆر»› ☰ خواهان

**مەیلنۆز** / meylnoz/: ☜ **مەدەنۆس**

**مەیلۆ** / meylo/: ناو. هەلۆرک؛ مێلۆ؛ لەلوو؛ لەلۆ؛ لەیلوێ ☰ نتو

**مەیلە** / meyle/: ناو. لۆرک و پەنیری تێکەڵ ☰ از لبنیات

**مەیلەو** / meylew/: ئامراز. ١. بەرەو ‹با مەیلەو خوار بڕوا› ٢. ئامال ‹بە ڕەنگێکی مەیلەو سوور› ☰ ١. بە سمتِ ٢. مُتمایل به

**مەیلی**[1] / meylî/: ئاوەڵناو. بە پێی مەیل و ئیشتیا ‹کار کردنی مەیلی› ☰ دلبخواهی

**مەیلی**[2]: ئاوەڵکار. بە مەیل ‹مەیلی کار ئەکات› ☰ دلبخواهی

**مەیماق** / meymaq/: ناو. پەیکەر؛ کۆتەڵ؛ تیمسال ☰ تندیس

**مەیمان** / meyman/: ☜ **میوان**

**مەیمانی** / meymanî/: ☜ **میوانی**

**مەیموون** / meymûn/: ناو. ١. ☜ **میوان** ٢. مووەمی؛ مەمینە ☰ ١. ☜ **میوان** ٢. میمون

**مەینۆش** / meynoş/: ☜ **مەیخۆرەوە**

**مەینۆشی** / meynoşî/: ناو. کاری شەراو خواردنەوە ☰ میخوارگی

**مەینە** / meynne/: ناو. ١. نێوان ٢. کەمبەرە ٣. قەدی کێو ☰ ١. میانە ٢. کمربند ٣. ستیغ کوه

**مەینەت** / meynet/: ناو. ١. دەرد و ئازار ٢. خەم و خەفەت ☰ ١. درد و رنج ٢. غم

**مەینەتبار** / meynetbar/: ئاوەڵناو. خەمبار ☰ محنت‌بار

**مەینەتی**[1] / meynetî/: ناو. خەم؛ خەفەت ☰ غم

**مەینەتی**[2]: ئاوەڵناو. مەینەتبار؛ خەمبار ‹منی مەینەتی کوا هەلی وام بۆ هەڵدەکەوێ؟› ☰ غمزده

**مەیو** / meyw/: ☜ **مەیوە ـ١**

**مەیوە** / meywe/: ناو. ١. مەیو؛ ڕەز؛ داری ترێ ٢. ☜ **میوە** ☰ ١. تاک ٢. ☜ **میوە**

**مەیوو** / meyû/: ☜ **مەییو**

**مەیەس** / meyes/: ☜ **مێش ـ١**

**مەیی** / meyî/: ☜ **مەییو**

**مەیین** / meyîn/: چاوگ. مەهین؛ مەیان: ١. توند بوونەوەی تراو لە ئامانێکەوە ٢. داوەستان و نەبزووتنی ئاو و ... ٣. لە جێی خۆ وشک بوون ‹ئازایی، جوامێری، بیروباوەڕی ئاگرین/ لە سەنگەرەکانی خۆیاندا مەیین/ پێش ئەوەی فریای پەلەپیتکەی تەقینەوەی خۆیان کەون «شێرکۆ»› ☰ ١. بستن مایع ٢. راکد بودن آب ٣. خُشک زدن

**مەییو** / meyîw/: ئاوەڵناو. مەیوو؛ مەیی؛ توندەوە بووی تراو ‹شیری مەییو، وەک ماست وایە› ☰ بندآمده

**مه** / mih/: ☜ **مەڕ ـ١**

◙ **مها قەن**: مەڕی ڕەش ☰ **گوسفند سیاه**

**مها کن**: کوڕڕە؛ پەزی گوێ کورت ☰ **گوسفند گوش کوتاه**

**مهائاڤێ** / m(i)ha'avê/: ناو. جانەوەرێکی ئاوژییە وەک سمۆرە دەچێ ☰ سمور آبی

**مهار** / m(i)har/: ☜ **مەهار**

**مهاردی** / m(i)hardî/: ناو. ڕفێدە؛ مایە ☰ بالشتک نانوایی

**مهان** / m(i)han/: ☜ **ماین**

**مهاندن** / m(i)handin/: چاوگ. هەرس کردن؛ هەڵتاواندن؛ گڤیراندن ☰ هضم کردن

**مهانی** / m(i)hanî/: ☜ **مانگانە**

**مهتن** / mihtin/: چاوگ. مژین؛ مژ لێ دان ☰ مُک زدن

**مهتۆک** / mihtok/: ئاوەڵناو. ١. تایبەتمەندی بێچوویێ کە زۆر دایکی دەچەکنێ ٢. شیاوی مژین ☰ ١. ویژگی بچه‌ای که زیاد مادرش را بمکد ٢. مکیدنی

**مهتەر** / mihter/: ☜ **مەیتەر**

**مهرەجان** / mihrecan/: ☜ **مێهرەجان**

**مهسک** / mihsik/: ناو. مەست؛ پالای لە هەمانە ☰ نوعی پای‌افزار

**مهکەک** / mihkek/: ناو. پەزی پچووک ☰ گوسفند ریز

**مهۆ** / m(i)ho/: ☜ **مرۆڤ**

**مهە** / m(i)he/: ناو. شەراو؛ مەی ☰ مَی

**مهەبەت** / m(i)hebet/: ☜ **مۆڤەت**

**مهەس** / m(i)hes/: ناو. قاشاغ؛ ڕنەک ☰ قشو

**مهەندیس** / m(i)hendîs/: ناو. موهەندیس؛ ئەندازیار ☰ مهندس

**مهین** / m(i)hîn/: ناو. میین: ١. مایین؛ مێوینەی ئەسپ ٢. سنگی لە دار ٣. بزمار و ئالقە بۆ شت هەلاوەسین ٤. گەمەیەکی مندالان ☰ ١. مادیان ٢. میخ چوبی ٣. رخت‌آویز ۴. نوعی بازی کودکانە

**مهێ** / m(i)hê/: ☜ **میهی**

**می** / mî/: ☜ **مو ـ١**

**میائاڤێ** / m(i)ya'avê/: ناو. مەیکێ‌ئاڤێ؛ مێکێ‌ئاڤێ؛ جۆرێ سەگی ئاوی سووری ئامال ڕەشە، پێست و ڕۆنەکەی زۆر بەنرخە ☰ نوعی سگ آبی

**میان** / m(i)yan/: ناو. مابەین؛ بەین ☰ وسط؛ میان

▣ **میانی هەلل**: ☜ **میانێ هەلە**

**میانێ هەلە**: میانی هەلل؛ نیمەڕۆ؛ نیوەڕۆ ☰ نیمروز

**میانپۆلان** / m(i)yanpolan/: ناو. ناو هەر دوو شان؛ قەلاندۆش ☰ میان دو کتف

**میانچی** / m(i)yançî/: ناو. ناوبژیکەر؛ بەریوان؛ ناوجێ‌کەر ☰ میانجی

**میاندار** / m(i)yandar/: ئاوەلناو. نیوەکوتراو (دەخل و دان) ☰ نیمکوب (غلّە)

**میانە**[1] / m(i)yane/: ناو. ١. بەین؛ مابەین ٢. جێگە خەوی تەویلەوان لە تەویلەدا ٣. ناوقەد؛ کەمبەر ٤. ناوەندی پشت لە سەرەوە تا خوار ٥. پارچەیەکی دارین لە قەدی قلیاناویدا ☰ ١. میانە ٢. خوابگاه اصطبلبان در اصطبل ٣. کمر ۴. پشت ۵. وسط قلیان

**میانە**[2]: ئاوەلناو. ناونجی ‹ئادابش زەریف کەسێو چوون حووروەن/ بالاش میانە خەیرولئومووروەن «مەولەوی»› ☰ متوسط

**میانەباری** / m(i)yanebarî/: ئاوەلناو. بەژن‌زراڤ؛ قەدباریک ☰ کمرباریک

**میانەڕۆیی** / m(i)yaneřoyî/: ناو. ناوەندیتی؛ بارودۆخی میانەڕۆ بوون ☰ میانەروی

**میانەڕەو** / m(i)yanerew/: ئاوەلناو. نە زۆر توند نە زۆر شل لە مەبەست و ئاکاردا ☰ میانەرو

**میانی**[1] / m(i)yanî/: ناو. نهێنی؛ سڕ؛ ڤەشارتی ☰ راز

**میانی**[2]: ئاوەلناو. ناوەڕاستی؛ ناوەندی؛ ناوگین ☰ وسطی

**میانێن** / m(i)yanên/: ناو. ناوەڕاست؛ دوڕ؛ ناوەند ☰ وسط

**میاو** / m(i)yaw/: دەنگەناو. دەنگی پشیلە ☰ میو

**میاواندن** / m(i)yawandin/: چاوگ. میەوانن؛ دەنگ بەرز کردنەوەی پشیلە ‹ڕووەو کەیبانوو جار جار ئەیمیاوان/ لە ڕووی کەیبانوو ئیخلاسی ئەنوان «قانع»› ☰ میو کردن گربە

**میاونای** / m(i)yawnay/: چاوگ. میاواندن (پشیلە) ☰ میو کردن (گربە)

**میت**[1] / mît/: ناو. ١. قیتایی؛ زەقایی ٢. قامکەتووتە ٣. مت؛ متە؛ مووش؛ گوێچ؛ شتێ کە لە کەلایێندا لە سەر زەوی دادەنرێ ٤. کەلا؛ کەللا؛ هەلمات ☰ ١. برجستگی ٢. انگشت کوچکە ٣. چیزی کە در تیلەبازی بر زمین نهند ۴. تیلە

**میت**[2]: ئاوەلناو. قیت؛ قوت ☰ قُد

▣ **میت کردن**: قیت کردن ‹گوهێ خۆ میت کریە›

⚞ قُد کردن

**میتان / mîtan/**: ناو. کراس ‹ل بەژنا تە دبینم خوەش/ ب تورمە شال و میتانە «جگەرخوێن»› ⚞ پیراهن

**میتاوی / mîtawî/**: ناو. کەپری ناو بێستان کە لە سەری دەخەون ⚞ کپری کە بر آن می‌خوابند

**میتر / mîtr/**: ناو. مەتر؛ مەترە: ١. یەکەی سەرەکی پێوانی درێژایی لە دەزگای میتریدا کە دەکاتە ١٠٠ سانتی‌میتر ٢. نەوارێکی باریک و پلەک لێ دراو لە کانزا، قوماش و... بۆ پێوانی درێژایی ⚞ ١و٢. متر

▣ **میتری چوارپاڵو**: ☜ **میتری سێ‌جا**

**میتری چوارگۆش**: ☜ **میتری دوجا**

**میتری دوجا**: میتری چوارگۆش؛ یەکەی پێوانی ڕووبەر لە دەزگای میتریدا بەرامبەر بە ١٠٠٠٠ سانتی‌میتری چوارگۆش ⚞ متر مربع

**میتری سێ‌جا**: میتری چوارپالوو؛ یەکەی پێوانی بارستایی لە دەزگای میتریدا بەرامبەر بە ١٠٠٠٠٠٠ سانتی‌میتری چوارپالوو ⚞ متر مکعب

⊡ **میتر کردن**: پێوان؛ گەز کردن؛ درێژی یان پانتایەک پێوان ⚞ متر کردن

**میتک / mîtik/**: ناو. ١. مورد؛ گیایەکە بە پنچک دەڕوێ ٢. ☜ **میتکە** ٣. ☜ **میتوکە** ⚞ ١. گیاه مورد ٢. ☜ **میتکە** ٣. ☜ **میتوکە**

**میتکە / mîtke/**: ناو. [شوورەیی] میتک؛ میتۆ؛ میتۆڵ؛ میتۆڵە؛ بەلوو؛ بەلۆکە ⚞ چوچولە

**میتگ / mîtig/**: ☜ **موورتك**

**میتن / mîtin/**: ☜ **مژین**

**میتولکە / mîtulke/**: ☜ **میتوکە**

**میتۆ / mîto/**: ناوەڵناو. چاوپرووش؛ کوێرە مووشە ⚞ دارای چشمِ کم‌سو

**میتۆڵ / mîtoł/**: ☜ **میتکە**

**میتۆلانە / mîtołane/**: ناوەڵناو. بووچکەلانە؛ بێچوولانە؛ بووچکەلە ⚞ کوچولو

**میتۆڵە / mîtołe/**: ☜ **میتکە**

**میتولە / mîtûle/**: ☜ **میتوکە**

**میتەلا / mîtela/**: ناوەڵناو. ئالدوز؛ زێڕکفت ⚞ زراندود

**میتێن / mîtên/**: ☜ **میشێن**

**میجاز / mîcaz/**: ناو. ١. خوو؛ خدە ٢. قەول؛ گفت؛ پەیمان ‹ژن بێ‌میجازن› ⚞ ١. خو؛ عادت ٢. عهد

**میجبێتی / mîcbêtî/**: ناو. تەوجی؛ باربوو؛ پیتاک ⚞ باج و خراج

**میجک / mîcik/**: ناوەڵناو. مەزبووت؛ گورج و گۆڵ ⚞ چُست و چالاک

**میجێز / mîcêz/**: ناو. بیانوو؛ بیانک ‹دەک نەمێنم، چەند پایزێکی لە من بە میجێزە «بەیت»› ⚞ بهانە

**میچ[1] / mîç/**: ناو. ١. بن‌بان؛ سەرمیچ؛ دیوی خوارەوەی سەربان ٢. جگ؛ چوو؛ قاپ ⚞ ١. سقف ٢. شتالنگ؛ قاپ

▣ **میچی قومارخانە**: [مەجازی] ڕووهەڵماڵاوی گوێ‌نەدەر بە عەیب و عار ⚞ قاپ قمارخانە

**میچ[2]**: ناوەڵناو. پێ‌چەقێن؛ چیڕ ‹هێندە میچ مەبە! گوێ لە قسەی گەورەترت بگرە!› ⚞ مُصِر

⊡ **میچ کردن**: پێ چەقاندن ⚞ پافشاری کردن

**میچاڵ / mîçal/**: ناو. هەندێکی کەم ⚞ مقداری اندک

**میچالەک / mîçalek/**: ناوەڵکار. تۆزقاڵێ؛ پیچەک؛ کەمووسکەیەک ⚞ اندکی

**میچڕان / mîçřan/**: چاوگ. بە سەریەکدا گلۆفان ⚞ بر هم فشردن

**میچڕاندن / mîçřandin/**: چاوگ. بە سەر یەکا گلۆفاندن ⚞ بر هم فشردن

**میچک / mîçik/**: ناو. مێوینەی مەل ⚞ مادەی

پرندگان

**میچڵە** / mîçłe/: ناو. چیپری و گیری 🇮🇷 پافشاری

**میچڵێ** / mîçłê/: ☜ **چۆڵەکە**

**میچۆڵکە** / mîçołke/: ☜ **مچۆڵە**

⊡ **میچۆڵکە کردن:** لە ناو مشتدا گرتنەوە ‹دا وەرە لەگەڵم هێندێ کەشک میچۆڵکە بکە!› 🇮🇷 در کف دست شکل دادن

**میچۆڵە** / mîçołe/: ☜ **مچۆڵە**

**میچێن** / mîçên/: ناو. جگێن؛ قاپێن 🇮🇷 قاب‌بازی

**میحراب** / mîĥrab/: ناو. میحراو؛ جێگەی نوێژ لە مزگەوتا ‹مەی نە پای میحراب مەسجد وەردەنم/ تەجدید مەزهەب عیسا کەردەنم «ئەحمەد بەگی کۆماسی»› 🇮🇷 محراب

**میحراو** / mîĥraw/: ☜ **میحراب**

**میخانە** / mîxane/: ناو. گوڵمیخ؛ سنگی ئاسن 🇮🇷 میخ کلفت

**میدا** / mîda/: ☜ **میداد**

**میداد** / mîdad/: ناو. میدا؛ پێنووس؛ قەڵەمڕەساس 🇮🇷 مداد

**میدادسڕ** / mîdadsiř/: ناو. مەساحە؛ خەت‌کوورەوەکەر 🇮🇷 مدادپاک‌کن

**میداڵ** / mîdał/: ناو. مەداڵ؛ نیشان؛ دروشم؛ کانزایەکی نەخشراوی وەک سکە کە بە بۆنەی بیرەوەری کەسایەتی یان ڕووداوێکەوە، یان بۆ خەڵات، لێ‌دراوە و لە مل دەکرێ یان بە سەر سینگەوە دەنرێ 🇮🇷 مدال

**میدە** / mîde/: ☜ **ماعدە**

**میر**[1] / mîr/: ناو. ١. سەرۆک؛ سەردار ‹میری ڕەواندز› ٢. لاتەنیشتی قوڵی جگ ٣. هەویر 🇮🇷 ١. امیر ٢. طرف گود جانبی شتالنگ ٣. خمیر

⊡ **میری میران:** سەرۆک؛ گەورەمیر 🇮🇷 فرمانروا

⊡ **میر کەردنە:** هەویر شێلان 🇮🇷 چلانیدن خمیر

**میر**[2]**:** پێشوشە. سەرۆک؛ سالار ‹میراو؛ میرپەنجە؛ میرکوڕ؛ میرەدێ› 🇮🇷 ـ میر

**میرات** / mîrat/: ناو. کەلەپوور؛ ماڵی بەجێماو لە مردوو ‹میراتی کەر بۆ کەمتیارە! «مەسەل»› 🇮🇷 ارث

⊡ **(شتێ) بە میراتی کەسێک کەوتن:** بە میراتی کەسێک بوون؛ نەمان و قازانج نەبردن لە شتێک ‹ئەو ماڵەی لە ئێمەت دابڕی، یاخوا بە میراتت کەوێ!› 🇮🇷 مُردن و بهره نبردن از چیزی

**بە میراتی کەسێک بوون:** ☜ **(شتێ) بە میراتی کەسێک کەوتن**

**میراتبەر** / mîratber/: ناو. میراتگر؛ کەلەپوورگر 🇮🇷 وارث

**میراتگر** / mîratgir/: ☜ **میراتبەر**

**میراتی** / mîratî/: ناوەڵناو. ١. سەر بە میرات ٢. *[کینایە]* چەپەڵ و شووم 🇮🇷 ١. ارثی ٢. پلید و نحس

**میراخوڕ** / mîraxuř/: ناو. میرتفاق؛ دیلەم؛ کەسێ کە بە سەر تەویلەی خان و شادا ڕادەگا 🇮🇷 میراخور

**میراز** / mîraz/: ناو. ١. هەویرترش ٢. کاری ساف و لووس کردنی ماڵەغان بە ئامێری تایبەتەوە (وەک: چەکوچ و سێ پایەی تایبەت) 🇮🇷 ١. خمیرمایه ٢. محل تیز کردن داس بزرگ

**میراش** / mîraş/: ناو. خاوەن ئاسیاو 🇮🇷 صاحب آسیاب

**میراڤ** / mîrav/: ☜ **میراو**

**میران** / mîran/: ناو. لەقەمی هێندێ لە سەرەک عەشرەتان 🇮🇷 لقب برخی از سران قبیله

**میرانە** / mîrane/: ناو. باجێ کە دەدرێ بە میر 🇮🇷 باج امیری

**میرانی** / mîranî/: ناو. ١. جۆرێ ترێ ٢. جۆرێ هەڵپەڕکێ 🇮🇷 ١. نوعی انگور ٢. نوعی رقص

**میراو** / mîraw/: ناو. مەرداب؛ میراڤ؛ وەراز؛ ئاریختێ؛ کەراخ؛ ئەو کەسەی بە سەر بەش

کردنی ئاودا ڕادەگا ‹کە شیرین و تەڕی دی شیعرەکانم/ وتی مەحوی کە، میراوی فوراتی «مەحوی»› 🇮🇷 میراب

**میرایەتی** / mîrayetî/: ناو. گەورەیی و دەسەڵاتداری 🇮🇷 بزرگی و اقتدار

**میرپەنجە** / mîrpence/: ئاوەڵناو. *[مەجازی]* ئازا و بەڕێز و قەدر 🇮🇷 شُجاع و مُحترم

**میرتفاق** / mîrt(i)faq/: ☜ **میراخور**

**میرج** / mîrc/: ☜ **مرج**

**میرچ** / mîrç/: ☜ **ملچ**

**میرچک** / mîrçik/: ناو. ١. مەلیچک؛ چۆلەکە؛ چێشکە ٢. باڵداری مێوینە 🇮🇷 ١. گُنجشک ٢. پرندەی مادە

**میرخەزەب** / mîrxezeb/: ☜ **میرغەزەب**

**میرخەزەو** / mîrxezew/: ☜ **میرغەزەب**

**میرزا** / mîrza/: ناو. ١. مونشی؛ نووسەنە ٢. ڕێزناوێک بۆ خوێندەواران بێجگە مەلا ‹میرزا حوسەین› ٣. ڕێزناوێک لە پاش ناوی شازادەکان ‹عەباس میرزا› 🇮🇷 ١تا٣. میرزا

**میرزادە** / mîrzade/: ناو. بەچکە میر 🇮🇷 امیرزادە

**میرزنگ** / mîrzîng/: ☜ **برژانگ**

**میرغەزەب** / mîrğezeb/: ناو. میرخەزەب؛ میرخەزەو؛ جەللاد؛ جەلاب؛ کاربەدەستی شا و خان بۆ ئازار دانی خەڵک 🇮🇷 میرغضب

**میرفان** / mîrfan/: ☜ **میوان**

**میرفانی** / mîrfanî/: ☜ **میوانی**

**میرک** / mîrik/: ناو. ١. بەردەستی میر ٢. جێگەی ڕۆنیشتنی میر لە کۆڕدا ٣. ئانیشک؛ قنگانیسک 🇮🇷 ١. مُباشر امیر ٢. جای نشستن امیر ٣. آرنج

**میرکوت** / mîrkut/: ناو. نەخۆشییەکە وەک سووریژە لە زارۆکان دێ 🇮🇷 نوعی بیماری سرخک مانند

**میرکوڕ**[1] / mîrkuř/: ناو. شازادە 🇮🇷 امیرزادە

**میرکوڕ**[2]: ئاوەڵناو. هەڵبژاردە؛ بلیمەت 🇮🇷 نابغە

**میرکوژ** / mîrkuj/: ئاوەڵناو. مرۆکوژ؛ قاتل 🇮🇷 آدمکُش

**میرگزیرکێ** / mîrg(i)zîrkê/: ☜ **میروگزیر**

**میرمەزن** / mîrmezin/: ناو. خان؛ بەگ؛ ئاغا؛ سان؛ نازناوی دەسەڵاتداران و سەرەکهۆزان 🇮🇷 خان

**میرمیران** / mîrmîran/: ناو. خانێ کە چەند میری ژێر فەرمانە 🇮🇷 خان خانان

**میرمیرێن** / mîrmîrên/: ناو. گەمەی میر سازدان بۆ گاڵتە 🇮🇷 از بازی‌ها

**میرنشین** / mîrn(i)şîn/: ناو. جێگەی ژیانی میر ‹میرنشینی بابان› 🇮🇷 امیرنشین

**میروگزیر** / mîr û g(i)zîr/: ناو. میرگزیرکێ؛ شا و وەزیر؛ جۆرێ گەمە بە جگ 🇮🇷 نوعی قاب‌بازی

**میرۆ** / mîro/: ☜ **مێروولە**

**میرۆک** / mîrok/: ناو. گەرای مێروولە 🇮🇷 تخم مورچە

**میروو** / mîrû/: ☜ **مێروولە**

**میرە** / mîre/: ناو. ١. قوێخا؛ کوێخا ٢. شوو؛ مێرد ٣. مەزرینگەی ئابوورەمەنی سپا ٤. نازناوی پیاوماقووڵی کاکەیی ٥. جێژوان ٦. بەگ؛ ئاغا 🇮🇷 ١. کدخدا ٢. شوهر ٣. سررشتەداری ۴. لقب روحانی اهل حق ۵. میعادگاه ۶. بیگ؛ خان

**میرەدێ** / mîredê/: ناو. ١. گوندێ کە میری لێ دەژی ٢. گوندی قەوغا 🇮🇷 ١. دهکدەی امیرنشین ٢. دە بزرگ

**میرەماڵ** / mîremał/: ناو. ماڵەگەورە ‹نۆفەل سەرنگوون ماڵش وە تالان/ گرد بی وە سەربەش پەی میرەماڵان «خانای قوبادی»› 🇮🇷 بزرگ‌خاندان

**میرهی** / mîrhî/: ☜ **مەهیر**

**میرهێ** / mîrhê/: ☜ **مەهیر**

**میری**[1] / mîrî/: ناو. ١. سەرۆکی ٢. ئەو بەشە لە ماڵ و دارایی کە ڕادەگوێزرێ 🇮🇷 ١. امارت ٢. اموال

منقول

**میری**[٢]: ئاوەڵناو. سەر بە دەوڵەت ☰ حکومتی؛ دولتی

**میز**[١] / mîz/: ناو. مێز: ١. مێزکاڵ؛ گمێز ‹چایەکەی مامە غەفوورم زەردە وەک میزی نەخۆش/ ئیحتیاج ناکا بە ئاگر هەر بە دوو تڕ دێتە جۆش! «شێخ ڕەزا»› ٢. تەختەی بە پێچکە بۆ شت لە سەر دانان ☰ ١. ادرار ٢. میز

⊡ **میز بە خۆدا کردن**: ١. بە میز خۆ تەڕ کردن ٢. [کینایە] زۆر ترسان ☰ ١. خود را خیس کردن ٢. خیلی ترسیدن

**میز کردن**: گمێز کردن ☰ شاشیدن

**میز کەف کردن**: [پلار] نابەجێ ویستن؛ گەرەک بوونێکی نەگونجاو ☰ شاش کف کردن

**میز گیران**: میز بۆ نەکران ☰ شاشبند شدن

**میز**[٢]: دەنگەناو. دەنگی زەرگەتە و مەشە و مێش ... ☰ وز ـ وز حشرات

**میزاڤ** / mîzav/: ☜ **میزاو**

**میزان** / mîzan/: ئاوەڵناو. بەرامبەر؛ هاوتەراز؛ هاوسەنگ ☰ برابر

**میزاو** / mîzaw/: ناو. میزاڤ؛ ئاوی زۆر کەم کە لە سەر چاوە یان بە جۆگەدا دێ ☰ آب اندک کە در جوی یا از سرچشمە آید

**میزبەزێن** / mîzbezên/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی زارۆکێ کە گمێز لە بێشکەوە دەردەپەڕێنێ ☰ ویژگی کودکی کە شاشش از گهوارە بیرون ریزد

**میزتن** / mîztin/: چاوگ. تێنەپەر. //میزتی؛ دەمیزی؛ بمیزە// مێزتن؛ میزیان: ١. گمێز کردن ٢. دەرپەڕینی باریکە ئاو لە دەفرەوە ‹ئاشێ لە میزتن بێ هەر دەمیزێ! «مەسەل»› ٣. دەرپەڕینی دەنکە گەنم لە نێوان دوو بەرداشدا ☰ ١. شاشیدن ٢. بیرون جهیدن باریکەی آب از ظرف ٣. بیرون جهیدن گندم از لای دو سنگ آسیاب

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: میزتوو/ چاوگی نەرێنی: نەمیزتن

**میزدان** / mîzdan/: ☜ **میزەڵدان**

**میزدانک** / mîzdanik/: ☜ **میزەڵدان**

**میزراب** / mîzrab/: ناو. شکافە؛ دەنووکە؛ پێژەن؛ زەخمە ☰ مضراب

**میزفک** / mîzfik/: ☜ **مێزەفك**

**میزڵدان** / mîziłdan/: ☜ **میزەڵدان**

**میزن** / mîzin/: ئاوەڵناو. [پلار] ١. کونەدەمێز؛ خۆتەڕکەر ٢. بەوزە و گیزە ☰ ١. شاشو ٢. وزوزی

**میزنای** / mîznay/: چاوگ. میزەمیز کردن ☰ وزـ وز کردن

**میزۆ** / mîzo/: ناو. دەندە؛ ئەو پارچەدارەی گاسنی دەچێتە ناو ☰ قطعەای چوبی در گاوآهن

**میزۆک** / mîzok/: ناو. کونی میز پێدا هاتنە دەر ☰ مجرای ادرار

**میزوو** / mîzû/: ناو. کیرەوڵ؛ چەرمی شۆڕی ژێر سکی جوانەگا کە ئەندامی نێرینەی لێوە دێتە دەرێ ☰ پوشش آلت تناسلی گاو نر

**میزە** / mîze/: ناو. گیزە؛ وزە ☰ وزـ وز

**میزەچرکە** / mîzeçirke/: ☜ **میزەچورتکێ**

**میزەچرکێ** / mîzeçirkê/: ☜ **میزەچورتکێ**

**میزەچڕکێ** / mîzeçiřkê/: ☜ **میزەچورتکێ**

**میزەچوتکە** / mîzeçutke/: ☜ **میزەچورتکێ**

**میزەچورتکە** / mîzeçurtke/: ☜ **میزەچورتکێ**

**میزەچورتکێ** / mîzeçurtkê/: ناو. گمێزەچۆرتکێ؛ میزەچرکە؛ میزەچرکێ؛ میزەچڕکێ؛ میزەچوتکە؛ میزەچورتێ؛ میزەچورتکە؛ میزەچۆڕکێ؛ مێزەچورتکێ؛ مێزەچورتکە؛ چرتکەمیز ☰ چکمیزک

**میزەچورتێ** / mîzeçurtê/: ☜ **میزەچورتکێ**

**میزەچۆڕکێ** / mîzeçořkê/: ☜ **میزەچورتکێ**

**میزەڕۆ** / mîzeřo/: ناو. ڕەگێ کە میزی پێدا دێ ☰ مجرای ادرار

**میزەک** / mîzek/: ئاوەڵناو. [پلار] میزن؛ کونەدەمیز؛

دەڵەمێز؛ تایبەتمەندی کەسێ کە میز بە خۆیدا دەکا 🇮🇷 شاشو

**میزەگایلە** / mîzegayle/: ناو. زیگزاگ؛ لابەلا؛ ڕێگە یان هێڵی خوار و یەک لە دوای یەک شکاو 🇮🇷 زیگزاگ

**میزەڵ** / mîzeł/: ناوەڵناو. میزەڵ؛ دەڵەمێز؛ بە کردەوە یا خۆی میز بە خۆدا کردن 🇮🇷 شاشو

**میزەڵان** / mîzełan/: ناو. فوودان؛ تیزانگ 🇮🇷 بادکُنک

**میزەڵدان** / mîzełdan/: ناو. مسوڵدان؛ مووسڵدان؛ موسوڵدان؛ میزدان؛ مێزدان؛ میزدانک؛ میزڵدان؛ میسمیسک؛ گمێزدان 🇮🇷 مثانه

**میزەمیز** / mîzemîz/: دەنگەناو. ١. میزەی زۆر و لە شوێن یەک ٢. *[مەجازی]* قسەی هێواشی لە بن ناقەوە و بە شێوەیێ کە کەسی تێ نەگا 🇮🇷 ١. وز-وز پیاپی ٢. غُر-غُر

**میزهێن** / mîzhên/: ناوەڵناو. ئاسانکەر و زۆرکەرەوەی ڕێژەی میز ‹چای میزهێنە› 🇮🇷 مُدر

**میزی** / mîzî/: ناو. جێگەی خەتەنە 🇮🇷 جای ختنه

**میزیان** / mîzyan/: چاوگ. ١. میزتن؛ گمێز کردن ٢. ئاو بە تەوژم لە قەڵشی دەفرەوە دەرچوون 🇮🇷 ١. شاشیدن ٢. آب از درز برون جستن

**میژدە** / mîjde/: ☜ مەجیدی ـ٢

**میژوەرد** / mîjwerd/: ☜ مژیوەر

**میژوەردی** / mîjwerdî/: ☜ مژیوەر

**میژۆل** / mîjol/: ناو. برژانگ 🇮🇷 مُژه

**میس** / mîs/: ناو. ١. ماچ؛ ڕامووس؛ ڕەوتی ڕامووسان ٢. چۆنیەتی توند بۆن کردن 🇮🇷 ١. بوسه ٢. چگونگی تُند بو کشیدن

**میساب** / mîsab/: ناو. مشتەی پینەچی 🇮🇷 مشتەی پینەدوز

**میساخە** / mîsaxe/: ناو. ئارداوێژ؛ جێ هاتنە دەری ئارد بە دەوری بەرداشدا 🇮🇷 جای آرد پیرامون سنگ آسیا

**میساس** / mîsas/: ☜ مەساسە

**میساسە** / mîsase/: ☜ مەساسە

**میسان** / mîsan/: چاوگ. ١. ڕامووسان؛ ماچ کردن ٢. بۆن کردنی توند 🇮🇷 ١. بوسیدن ٢. تُند بو کشیدن

**میستن** / mîstin/: چاوگ. ١. میسین؛ گمێز کردن؛ میز کردن ٢. مژین؛ هەڵمژین ٣. دەرپەڕینی دەنکە گەنم لە نێوان دوو بەرداشدا 🇮🇷 ١. شاشیدن ٢. برمکیدن ٣. بیرون جهیدن دانەی گندم از بین دو سنگ آسیاب

**میسک** / mîsk/: ☜ مسك

**میسکە** / mîske/: ☜ مسکە

**میسمیسک** / mîsmîsik/: ☜ میزەڵدان

**میسواک** / mîswak/: ☜ مسواك

**میسین** / mîsîn/: ☜ میستن ـ١

**میش** / mîş/: ☜ مشك ـ١

**میشانی** / mîşanî/: ☜ مێشێن

**میشک** / mîşk/: ☜ مسك

**میشکات** / mîşkat/: ناو. ١. تاقەی چکۆلە ٢. جێ چرا 🇮🇷 ١. طاقچه ٢. مشکات

**میشەسی** / mîşesî/: ناو. گەڤرک؛ چێرگ 🇮🇷 هوبره

**میشەمر** / mîşemiř/: ناو. ماڵی چۆڵکراو 🇮🇷 خانەی متروُک

**میشەوش** / mîşewiş/: ☜ مەرزی

**میشی** / mîşî/: ناو. چرافتیلە؛ قودیلکە چرا 🇮🇷 چراغ موشی

**میغناتیز** / mîğnatîz/: ناو. مەگەن؛ مەگنەتیک 🇮🇷 مغناطیس

**میڤان** / mîvan/: ☜ میوان

**میڤانی** / mîvanî/: ☜ میوانی

**میڤە** / mîve/: ☜ میوە

**میقات** / mîqat/: ناوەڵناو. ڕاست، بێ پاش و پێش (سەعات) ‹سەعاتەکەم میقاتە› 🇮🇷 دقیق (ساعت)

**میقەسوک** / mîqesûk/: ☜ **مقەسۆك**

**میک** / mîk/: ☜ **مەڕ ـ١**

**میکاب** / mîkab/: ناو. مەترەی چوارگۆشە؛ میتری دووجا ≡ مترمربع

**میکانیک** / mîkanîk/: ناو. ١. بەشێک لە زانستی فیزیک کە دەپەرژێتە سەر وزە و هێز و کاریگەرییان لە سەر تەن ‹ئەندازیاری میکانیک› ٢. کەسێ کە پیشەی دروست کردنەوەی ماشین بەتایبەت ئوتومبیلە ≡ ١و٢. مکانیک

**میکروب** / mîkrub/: ناو. تەنیک؛ تەنیلە؛ میکرۆب؛ گیانداری یەکجار ورد بەتایبەت ئەوانەی کە دەبنە هۆی نەخۆشی گیانداران (وەک باکتری، یەکسیللولی و کارگ) ≡ میکروب

**میکروسکۆپ** / mîkruskop/: ناو. وردبین؛ ئامرازێ کە میکروب دەخاتە بەر چاو ≡ میکروسکوپ

**میکروفون** / mîkrufun/: ناو. دەنگبەر؛ ئامرازێ کە شەپۆلی دەنگ بۆ بلاو بوونەوە یان تۆمارکردن، دەکاتە شەپۆلی ئەلکتریکی ≡ میکروفن

**میکرۆب** / mîkrob/: ☜ **میکروب**

**میکە** / mîke/: ☜ **مووچن**

**میکەش** / mikeş/: ناو. کەمانچە؛ کەماچە ≡ کمانچە

**میل** / mîl/: ناو. مێل؛ مێلە: ١. کلچۆک؛ کلچێوک؛ هەوالی کلدان ٢. خەتی ڕاست لە کووتاڵدا ٣. زمانەی تەرازوو ٤. مایل؛ یەکەی مەودا لە ئینگلیس و ئەمریکا، بەرامبەر بە ١٦٠٩ میتر ٥. پارچە چێویکی گەورەی دەسکدار لە زۆرخانەدا کە جووتێکی هەڵدەگرن و لە سەر شان و باسک سووڕی دەدەن ٦. درەوشێکی باریکە بژیشکان دەناو برینی ڕادەکەن ٧. کێلی قەبر ٨. میلە؛ مێلە؛ پارچە کانزای گرۆڤەری درێژ و باریک ٩. خەتی ملی خاسەکەو ١٠. ☜ **میلی‌میتر** ≡ ١. میل سُرمەکشی ٢. خط مستقیم در پارچە ٣. شاهین ترازو ۴. مایل ۵. میل زورخانە ۶ میلەی جراحی ۷. شاهد قبر ۸ میلە ۹. نقش و نگار گردن کبک ١٠. ☜ **میلی‌میتر**

⊡ **میل دان**: میل دە برین ڕۆ کردن ≡ میلە زدن در جراحی

**میلاک** / mîlak/: ☜ **مێلاك**

**میلاوقلیان** / mîlawqilyan/: ناو. لوولەقلیان ≡ میل قلیان

**میلچۆک** / mîlçok/: ناو. میلچێوک؛ کلچۆک؛ کلچێوک ≡ میل سُرمەکشی

**میلچێوک** / mîlçêwik/: ☜ **میلچۆك**

**میلدان** / mîldan/: ناو. کلتوور؛ کلدان؛ سورمەدان ≡ سُرمەدان

**میلکان** / mîlkan/: ناو. جێگەی چادر و چیغ بەرپا کردنی خێلات ‹وا هێلانەگەی پاییز کرد خەورم/ پف کردەو میلکان گەلای چوو بەورم «سەعید عیبادەتیان»› ≡ خیمەگاه ایل

**میللەتخۆشەویست** / mîlletxoşewîst/: ناوەلناو. گەلحەز؛ نەتەوەپەرست ≡ ملتدوست

**میل ـ میل** / mîl mîl/: ناوەلناو. ڕاـ ڕا؛ ڕێ ـ ڕێ؛ خەت‌ـخەت؛ خیچ‌ـخیچ؛ گەخ‌ـگەخ؛ خێل‌ـخێل؛ کڕ‌ـکڕ؛ بە نەخشی هێل ـ هێلی لە پەنا یەکەوە ≡ راه ـ راه

**میلە** / mîle/: ناو. مێلە؛ پارچەکانزای گرۆڤەری درێژ و باریک ≡ میلە

**میلیارد** / mîlyard/: ☜ **ملیارد**

**میلیگرەم** / mîlîg(i)rem/: ناو. یەکەی پێوانی کێش بەرامبەر بە ٠،٠٠١ی گرەم ≡ میلی‌گرم

**میلیلیتر** / mîlîlîtr/: ناو. یەکەی پێوانی بارستایی بەرامبەر بە ٠،٠٠١ی لیتر ≡ میلی‌لیتر

**میلی‌میتر** / mîlîmîtr/: ناو. میل؛ یەکەی پێوانی درێژایی بەرامبەر بە ٠،٠٠١ی میتر ≡ میلی‌متر

**میلیۆن** / mîlyon/: ☜ **ملیۆن**

**میم** / mîm/: ناو. ١. ☜ **میمك** ٢. ناوی پیتی بیست و شەشەمینی ئەلفوبێی کوردی ☰ ١. ☜ **میمك** ٢. میم

**میمار** / mîmar/: ناو. ١. نەخۆشیی موو کە لە پەنجە دێت ٢. دمەڵی زۆر زل ☰ ١. کژدُمە ٢. دُمل بزرگ

**میمبەر** / mîmber/: ☜ **مینبەر**

**میمزا** / mîmza/: ☜ **میمکەزا**

**میمک** / mîm(i)k/: ناو. میم؛ میمی؛ میمگ؛ میمگە: ١. پوور؛ خوشکی دایک ٢. خوشکی باوک ☰ ١. خاله ٢. عمه

**میمکزا** / mîmikza/: ☜ **میمکەزا**

**میمکەزا** / mîmkeza/: ناو. میمزا؛ میمکزا؛ میمکەزاگ؛ ڕۆڵەی خوشکی دایک یان باوک ☰ خالەزاده یا عمەزاده

**میمکەزاگ** / mîmkezag/: ☜ **میمکەزا**

**میمگ** / mîmig/: ☜ **میمك**

**میمگە** / mîmge/: ☜ **میمك**

**میمنایی** / mîmnayî/: ☜ **مۆمیایی**

**میمۆک** / mîmok/: ناو. مێکووک؛ میمووک؛ مێمووک؛ بەلەک ☰ گیاه شیرین‌بیان

**میمو** / mîmû/: ☜ **میوان**

**میموک** / mîmûk/: ☜ **میمۆك**

**میمون** / mîmûn/: ☜ **میوان**

**میمی** / mîmî/: ☜ **میمك**

**مین** / mîn/: ناو. لوغم؛ لەخم؛ جۆرێ چەکی شەڕە کە لە شوێنێکدا دەچێنرێت و بە گەرما، دەنگ یان تەوژم دەتەقێتەوە ☰ مین

**مینا**[1] / mîna/: ناو. ١. شیشە؛ شووشە ٢. گولەمینا؛ گوڵنیشان؛ گولەمەمێشە؛ گوراڵەچەرمە؛ گیایەکی ڕازێنەیی پایا بە گەڵای هێلکەیی هێندێک ئەستوور و گوڵی سپی، پەمەیی یان ئاڵەوە ٣. کاژی یەکجار ڕەق و بریقەداری سەر ددان کە عاج و ناخی ددان دەپارێزێ ٤. باڵندەیەکە لە تۆرەمەی سێروو، نزیک ٢٥ سانتی‌میترە، سەری ڕەشە و نەختێ کاکۆڵی هەیە، دندووک و چاو و دەوری چاوی زەردە، کردەوەی وەک سێروو دەچێ، لە میچی خانوو، کونی دار و دیواردا هێلانە دەکا ☰ ١. شیشه ٢. گُل مینا ٣. مینای دندان ٤. پرندەی مینا

**مینا**[2]: ئامراز. وەکوو؛ لە گوێن ☰ مانند

**مینابەند** / mînabend/: ناو. شیشەبەند ☰ شیشەبند

**میناک** / mînak/: ناو،ئاو. هاوتا؛ وەک یەک ☰ شبیه

**میناکاری** / mînakarî/: ناو. شیشەبەندی ☰ شیشەکاری

**میناکی** / mînakî/: ناو. هاوتایی؛ بە دیمەن وەکوو یەک ☰ شباهت

**مینالغ** / mînaliğ/: ناو. شیشەبەندی ڕەنگاوڕەنگ ☰ شیشەبندی الوان

**میناهی** / mînahî/: ناو. هاوتایی ☰ شباهت

**مینبەر** / mînber/: ناو. میمبەر؛ مەمەر؛ دوانگە؛ نیەر؛ شوێنی بەرز بۆ وتار دان و مۆچیاری کردن ☰ منبر

**مینجا** / mînca/: ناو. دوڕ؛ مابەین ☰ وسط

**مینجان** / mîncan/: ناو. کار و ڕەوتی کایە کردن بە مینچ ☰ منچ‌بازی

**مینچ** / mînç/: ناو. منچ؛ کایەی دوو، سێ یان چوار کەسی لە سەر پەڕەیەکی چوارگۆش، کە هەرکام لە کایەکەران چوار مۆرەی هاوڕەنگیان هەیە، دەبێ بە تاس هەڵخستن لە نێو خانووەکاندا بیانبەنە پێش، تا پاش خولێکی تەواو بگاتە مەنزل. لە سەر ڕێ دەکرێ لە مۆرەی هاوملەکانیان بدەن یان مۆرەی خۆیان بەر لێدان بکەوێ و بگەڕێنەوە خانی ئەوەڵ ☰ منچ

**مینددۆز / mîndoz/**: ناو. ۱. ئامرازێک بۆ دۆزینەوەی مینی دەکارکراو ۲. ئەو کەسەی مین دەدۆزێتەوە و لە کاری دەخا ⊑ ۱و۲. مین‌یاب

**میندەر / mînder/**: ناو. دۆشەکۆڵە ⊑ تُشک کوچک

**مین‌ڕێژ / mînřêj/**: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی شوێنێ کە بە مین چێنرابێ و مەترسی تەقینەوەی لە سەر بێ ⊑ مین‌گذاری شده

**مین‌ڕێژی / mînřêjî/**: ناو. کار و ڕەوتی مین‌ڕێژ کردن ⊑ مین‌گذاری

**مینسن / mîn(i)sin/**: ☜ **مانسن**

**مینگا / mînga/**: ☜ **مەڕ-۱**

**مینگن / mîngin/**: ئاوەڵناو. منگن؛ تایبەتمەندی ئەوەی مینگە دەکا ⊑ ویژگی کسی کە تودماغی حرف می‌زند

**مینگنای / mîngnay/**: چاوگ. منگە کردن ⊑ تودماغی حرف زدن

**مینگە / mînge/**: ناو. منگە؛ دەنگی گن ⊑ صدای تودماغی

**مینگەیی / mîngeyî/**: ناو. ئەو دەنگانەی لە کەپۆدا دەگوترێن وەک: [نگ] لە [هەنگ] ⊑ صداهایی کە مخرج آن‌ها بینی است

**مین‌مینک / mînmînik/**: ناو. پەپوولە ⊑ پروانە

**مینە / mîne/**: ناو. ۱. مابەین؛ مینجا ۲. منە؛ کاری تۆژینەوە؛ پشکنین؛ شی کردنەوە ۳. گوڵێکە ⊑ ۱. وسط؛ میان ۲. پژوهش ۳. گلی است

**مینەق / mîneq/**: ناو. بەرهەڤکری؛ جڤات؛ کار و ڕەوتی کۆوە کردن و سامان دان ⊑ بسیج

**مینەک / mînek/**: ناو. باری ئازووخە و بژیوی کاروانچی و دەشتەوانان ⊑ بار آذوقەی کاروانیان

**مینەگ / mîneg/**: ناو. وڵاخی سواری و بارەبەر ⊑ حیوان سواری و باربر

**مینیاتۆر / mînyator/**: ناو. ۱. شێوە نیگارکێشییەکی کۆنی وڵاتانی ڕۆژهەڵات کە کتێب و پەرتووکیان پێ دەنەخشاند لە تایبەتمەندییەکانی ئەوەیە دوور و نزیکی تێدا بەدی ناکرێ ۲. نیگارکێشی بەو شێوە ⊑ ۱و۲. مینیاتور

**مینین / mînîn/**: چاوگ. وێکچوون؛ هاوشێوە بوون؛ میناهی هەبوون ⊑ شباهت داشتن

**میوان / mîwan/**: ناو. مێوان؛ مەهڤان؛ مەیڤان؛ مەیمان؛ مەیموون؛ میرفان؛ میموو؛ میموون؛ میڤان؛ میهمان؛ میهڤان؛ مێڤان؛ مێمان؛ ئەوەی لە لایەن کەسێکی ترەوە ڕادەگیرێ و دەحەوێتەوە ‹کشە کشە پۆپەڕەشە/ میوان شەوێ دوان خوەشە// کشە کشە پۆپەلارە/ میوان ئیسە تا بەهارە! «فولکلۆر»› ⊑ مهمان

⊡ **میوان بوون**: ۱. وەک میوان لە شوێنێک بوون ‹دوێشەو لە ماڵی خاڵم میوان بووم› ۲. هەبوونی بۆهاتن ‹دوێشەو دو نەفەر بینە میوانم/ یەی ساعەت بیشتر لە بەرق سووتانم// ئاغەی ساحیوماڵ وەگەرد خانم/ هەم بینە ئاگر ڕشیانە گیانم «شامی»› ⊑ ۱. مهمان شدن ۲. مهمان داشتن

**میوان بە ڕێ کردن**: میهڤان ڕێ کرن؛ میهڤان خودان کردن: ۱. باش بەخێو کردنی میوان ۲. مەیمان خستنە سەر ڕێ بۆ ڕۆیشتن ⊑ ۱. پذیرایی کردن از مهمان ۲. مهمان را بدرقه کردن

**میوان داکردن**: ☜ **میوان ڕاگرتن**

**میوان ڕاگرتن**: میوان داکردن؛ ڕێگەدانی میوان بۆ ناو ماڵ ⊑ مهمان پذیرفتن

**میوان هاتن**: هاتنی میوان بۆ ماڵی کەسێ ‹سبەینێ میوانمان بۆ دێ› ⊑ مهمان رسیدن

**میوانخانە / mîwanxane/**: ناو. میهمانخانە؛ مێوانخانە: ۱. دیوەخانی میوانان ۲. جێگەی شەو مانەوەی میوانان بە کرێ ⊑ ۱. اتاق پذیرایی ۲. مسافرخانە

**میوانـدار / mîwandar/:** ئاوەڵــناو. میهمانــــدار؛ مێڤاندار؛ تایبەتمەندی کەسێ کە زۆری میـوان هەیە و زۆریان ڕادەگرێ ≡ مهمان‌نواز

**میوانداری / mîwandarî/:** ناو. مێڤانداری؛ پەزیرایی لە میوان ≡ مهمان‌نوازی

**میوان‌دۆست / mîwandost/:** ☜ میوانەوین

**میوانگر / mîwangir/:** ئاوەڵناو. وجاخدار؛ بـەمیوان ≡ مهماندار

**میوانەوین / mîwanewîn/:** ئاوەڵناو. میهڤان‌دۆست؛ میوان‌دۆست ≡ مهماندوست

**میـوانی / mîwanî/:** نـاو. مێـــوانی؛ مـــەیمانی؛ میرفانی؛ میهمانی؛ میڤـانی؛ میهڤـانی؛ مێڤـانی؛ مێمانی: ١. مەیمانی ٢. چێشتی ئـارد و ڕۆن ≡ ١. مهمانی ٢. کاچی

**میوە / mîwe/:** نـاو. مەیوە؛ مێوە؛ میڤە؛ بەر؛ خوزار؛ فێقی؛ فێکی؛ فیقی؛ سەمەر؛ یەمیش؛ بەشـێ لـە ئەندامی گیا کە لە هەڵپێچانی بشکوژ بەدیهاتووە ≡ میوە

**میوەخـۆرە / mîwexore/:** نـاو. باڵــندەیەکە لــە تۆرەمـەی کلـکـزەردە، بـە درێژایـی نزیـک ٢٣ سانتی‌میتر، بە پۆل دەگەڕێن، میوە دەخـۆن، لـە نێو باخی میوە و خورما دەبینرێن ≡ میوەخور

**میوەڕن / mîweřin/:** ناو. ئەوەی کاری میوە چنینە ‹قەت خەفـەت نـاخۆم بـە لۆمـەی دوژمـن و تانـەی ڕەقیب/ میوەڕن کەی بـەرد ئـەخا هـەرگیز بـە داری بێ‌بەرا «قانع»› ≡ میوەچین

**میوەک / mîwek/:** ئاوەڵناو. داڵـەقاو؛ شـۆڕەوەبوو ≡ آویزان

**میوەگـەنان / mîwegenan/:** نـاو. *[کینایـە]* ڕەزبــەر؛ مانگی سەرەتای پاییز ≡ مهرماه

**میۆ / m(i)yo/:** ناو. نێوان؛ ناوەند ≡ مابین

**میە / m(i)ye/:** ☜ میهی

**میەدڵ / m(i)yedił/:** ئاوەڵناو. ترسنۆک؛ ترسەنۆک؛ بێ‌زات ≡ ترسو

**میەر / m(i)yer/:** ☜ مەڕ-١

**میەرگ / m(i)yerig/:** نـاو. مۆرە؛ مـوورگ؛ مـووروو ≡ مُهره

**میەرە / m(i)yere/:** ☜ مارەیی

**میەسڵ / m(i)yesił/:** نـاو. جندۆکــە؛ جنۆکــە؛ ئەوانگەل ≡ جن

**میەوانن / m(i)yewanin/:** ☜ میاواندن

**میهرەبــان / mîhreban/:** ئاوەڵــناو. میهـــرەوان؛ مێرەوان؛ مێریڤان؛ دلۆڤـان؛ دڵـنەرم؛ دڵ تـەنک؛ خاوەن بەزەیی و دڵنەرمی ≡ مهربان

**میهرەبانی / mîhrebanî/:** ناو. میهرەوانی؛ دلۆڤانی ≡ مهربانی

**میهرەجان / mîhrecan/:** ☜ مێهرەجان

**میهرەوان / mîhrewan/:** ☜ میهرەبان

**میهرەوانی / mîhrewanî/:** ☜ میهرەبانی

**میهڤان / mîhvan/:** ☜ میوان

◘ **میهڤان خودان کرن:** ☜ میوان بەڕێ کردن

**میهڤان ڕێ کرن:** ☜ میوان بەڕێ کردن

**میهڤاندۆست / mîhvandost/:** ☜ میوانەوین

**میهڤانی / mîhvanî/:** ☜ میوانی

**میهمان / mîhman/:** ☜ میوان

**میهمانخانە / mîhmanxane/:** ☜ میوانخانە

**میهماندار / mîhmandar/:** ☜ میواندار

**میهمانی / mîhmanî/:** ☜ میوانی

**میهمۆز / mîhmoz/:** ☜ مامزە

**میهـەنگ / mîheng/:** نـاو. ١. عــەیار؛ پێوانــە ٢. دەرەجــە؛ ئەندازەشـاندەر ≡ ١. پیمانـە ٢. درجـە؛ عقربە

**میهی / mîhî/:** ناو. مەڕ؛ مهێ؛ میە؛ مییە ≡ گوسفند

**میین / mîyin/:** ☜ مهین

**مییە / mîye/:** ☜ میهی

**مییـەدڵ / mîyedił/:** ئاوەڵــناو. *[کینایـە]* ترســنۆک؛

ترسەنۆک ☰ ترسو

**مێ**[1] / mê/: ناو. ١. ما؛ ماک؛ مێوەلە؛ مێوەلە؛ مێوینە؛ مێوە؛ مێینە؛ مێیە؛ مێیینە؛ نێ؛ مێنگە؛ هێمان؛ بەشێ لە گیانداران کە ئاوس دەبن و زا و زێ دەکەن ٢. مەڕ؛ پەز؛ مەهـ؛ مەها ‹تێخورە! تێخورە!/ مێ تیر و گوان پڕە «گۆران»› ٣. مەزە؛ چێژە ☰ ١. مادینه ٢. گوسفند ٣. مزه

**مێ**[2]: ئاوەڵناو. مێو؛ ما؛ مایەن؛ ماک؛ مایک؛ مایکە؛ ماچە؛ مێچکە؛ مۆن؛ سەر بە گیانداری مێوینە ☰ ماده

**مێباز** / mêbaz/: ئاوەڵناو. [شووروەیی] ژنباز؛ تۆلاز؛ گەڕا؛ ئۆگری ئەویندداری و هاوئامێزی کردن لەگەڵ ژنان ☰ زنباره

**مێتکە** / mêtke/: ☜ **مێتووکە**

**مێتن** / mêtin/: ☜ **مژین**

**مێتوکە** / mêtuke/: ☜ **مێتووکە**

**مێتولکە** / mêtulke/: ☜ **مێتووکە**

**مێتووکە** / mêtûke/: ناو. میتک؛ مێتکە؛ مێتولکە؛ مێتوکە؛ مێتوولکە؛ میتوولکە؛ میتوولە؛ ڕشک ☰ تُخم شپش

**مێتوولکە** / mêtûlke/: ☜ **مێتووکە**

**مێتێل** / mêtêl/: ناو. تەریبی دۆشەک و لێفە ☰ کوک لحاف و تُشک

**مێجزمە** / mêcizme/: ☜ **مێردەزمە**

**مێچک** / mêçik/: ناو. ١. بەرخی بێدایک کە هەموو مەڕێک دەمژێ ٢. مێ؛ مێوینە ٣. [مەجازی] ترسەنۆک؛ ترسەزاوەر ☰ ١. برّەی بی‌مادر که شیر دیگر گوسفندان را می‌خورد ٢. مادینه ٣. بُزدل

**مێچکە**[1] / mêçke/: ناو. ١. ما؛ماینە؛ مێ؛ ڕەگەزی مێی مرۆ و هەندێک گیانلەبەر ٢. [کینایە] ڕیایی و مەرایی ☰ ١. ماده که در قالب مقابل مذکر است ٢. تملق و چاپلوسی

**مێچکە**[2]: دەنگەناو. ملچە؛ دەنگی دەم لە خواردنا ☰ صدای دهان هنگام خوردن

**مێچکەمێچک**[1] / mêçkemêçk/: ناو. مەرایی و زمانلووسی ‹بە مێچکەمێچک کاری گیر هێنا› ☰ تملق و چرب‌زبانی

**مێچکەمێچک**[2]: دەنگەناو. ملچەملچ ☰ صدای پیاپی دهان هنگام خوردن

**مێچلگە** / mêçilge/: ناو. گرێو؛ مەرج ☰ شرطبندی

**مێچۆڵکە** / mêçołke/: ☜ **مچۆڵە**

**مێچۆڵە** / mêçołe/: ☜ **مچۆڵە**

**مێخ** / mêx/: ناو. ١. بزمار؛ مێخ ٢. سنگ؛ بزماری دارین ☰ ١. میخ ٢. میخ چوبین

**مێختەوێڵە** / mêxtewêłe/: ناو. ئەخیە ☰ میخ‌طویله

**مێخچە** / mêxçe/: ناو. بزمارۆک؛ مسمار؛ مێخەکە ☰ میخچه

**مێخڕێژ** / mêxřêj/: ئاوەڵناو. بزمارکوت؛ بزمارڕێژ ☰ میخکوب

**مێخزنجیر** / mêxzincîr/: ناو. مێخسنان؛ مەڕبەند ☰ میخ ستوربند

**مێخسکە** / mêxiske/: ناو. گولمێخ ☰ میخ طویله

**مێخسنان** / mêxs(i)nan/: ناو. ١. ☜ **مێخسندان** ٢. ☜ **مێخزنجیر**

**مێخسندان** / mêxsindan/: ناو. مێخسنان؛ سندانی ئاسنگەر ☰ سندان آهنگر

**مێخکوت** / mêxkut/: ئاوەڵناو. بزمارکوت ☰ میخکوب

**مێخڵەمە** / mêxłeme/: ☜ **مەخلەمە**

**مێخۆش** / mêxoş/: ☜ **مەیخۆش**

**مێخۆلی** / mêxolî/: ئاوەڵناو. حۆل؛ خول؛ گەللایی؛ گێژ و وێژ ☰ هالو

**مێخەک** / mêxek/: ناو. مێخەکی؛ خەوناوکە: ١. دارچکێکی جوانی گەڵا هەمیشە شینی باریک و بەرامبەر بە یەکە ٢. قەنەفل؛ گوڵی ئەو دارچکە کە زۆر بۆنخۆش و هەمەڕەنگەیە و بۆ دەرمان

دەشێ ☰ ١و٢. میخک

**مێخەکبەن** / mêxekben/: ☜ **مێخەکبەند**

**مێخەکبەند** / mêxekbend/: ناو. مێخەکبەن؛ بەرمووری لە مێخەک ☰ گردنبند از میخک

**مێخەکە** / mêxeke/: ☜ **مێخچە**

**مێخەکی**[1] / mêxekî/: ناو. مێخەک؛ خەوناوکە: ١. دارچکێکی جوانی گەڵا هەمیشە شینی باریک و بەرامبەر بە یەکە ٢. گوڵی ئەو دارچکە کە زۆر بۆنخۆش و هەمەڕەنگەیە و بۆ دەرمان دەشێ ☰ ١و٢. میخک

**مێخەکی**[2]: ئاوەڵناو. بە ڕەنگی مێخەک؛ سووری تاریکی مات ☰ بە رنگ میخک

**مێر**[1] / mêr/: ناو. ١. پیاو؛ پیاگ ‹شەو بۆ مێران قەلایە «مەسەل»› ٢. شوو؛ مێرد ‹کا ئەو مێر و کا ئەو ژن، کا ئەو کالێ ڕەمەزن/ کا لێلێ و کا لۆلۆ، کا ئەو حەیرانێ ل کۆ؟ «جگەرخوێن»› ٣. خۆشەویستی؛ خوەشەویسی ☰ ١. مرد ٢. شوهر ٣. محبت

**مێر**[2]: ئاوەڵناو. ١. شەرڤان؛ ئازا لە شەڕ ٢. دلاوا؛ ئاکارچاک ٣. پیر؛ بەتەمەن ☰ ١. جنگاور ٢. نیکوکار ٣. سالخوردە

**مێرا** / mêra/: ناو. پشتێند؛ پشتوێن؛ کەمەربەند؛ شاڵ ☰ شال

**مێراتی** / mêratî/: ناو. ١. ئازایەتی ٢. پیاوەتی ☰ ١. شُجاعت ٢. مردانگی

**مێرازایی** / mêrazayî/: ناو. مەردازایی؛ پیاوەتی ☰ مردانگی

**مێرانە** / mêrane/: ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. مێرەکی: ١. ئازایانە ٢. پیاوانە ☰ ١. شُجاعانە ٢. مردانە

**مێرانی** / mêranî/: ناو. ئازایەتی؛ بوێری ☰ شجاعت

**مێرخاس** / mêrxas/: ئاوەڵناو. ١. پیاو باش ٢. ئازا؛ بوێر ‹کیمە ئەز ...؟/ ئەزم ئەڤ گەرناس، ئەزم ئەڤ مێرخاس/ بەلێ ئەزم کورد «جگەرخوێن»› ☰ ١. نیکوکار ٢. شُجاع

**مێرخاسی** / mêrxasî/: ناو. ئەگیتی؛ جوامێری؛ غیرەت؛ لۆتیگەری ☰ جوانمردی

**مێرخوز** / mêrxuz/: ناو. جۆرێ ماسی ☰ نوعی ماهی

**مێرخوزار** / mêrxuzar/: ☜ **مێرغوزار**

**مێرد** / mêrd/: ناو. مێردە؛ مێر؛ شوو ☰ شوهر

◘ **مێرد کردن:** شوو کردن ☰ شوهر کردن

**مێردئەزمە** / mêrd'ezme/: ☜ **مێردەزمە**

**مێردانە** / mêrdane/: ئاوەڵناو. پیاوانە؛ مێرانە؛ مەردانە ☰ مردانه

**مێردترێنە** / mêrdt(i)řêne/: ناو. جۆرێ مووروی خشڵ ☰ نوعی مُهرەی زینتی

**مێردار** / mêrddar/: ئاوەڵناو. شوودار؛ خاوەن شوو ☰ شوهردار

**مێردڕەوە** / mêrdřewe/: ناو. محەجەری لێوارەی سەربان ☰ نردەی لبِ بام

**مێردم** / mêrdim/: ناو. ١. مەردم؛ خەڵک ٢. خزمی نێرینە ☰ ١. مردم ٢. خویشاوند مذکر

**مێردمنداڵ** / mêrdmindał/: ☜ **مێرمنداڵ**

**مێردە** / mêrde/: ناو. ١. ☜ **مێرد** ٢. پیاو ☰ ١. ☜ **مێرد** ٢. مَرد

**مێردەزمە** / mêrdez(i)me/: ناو. مێردئەزمە؛ مێجزمە: ١. *[باوەڕی کۆن]* پیرهەڤۆک؛ جنۆکەی مرۆترسێن ٢. مۆتەکە؛ کاوس ٣. بەردی قەوەت تاقی کردنەوە ☰ ١. غول بیابانی ٢. کابوس ٣. سنگ زورآزمایی

**مێردەک** / mêrdek/: ناو. بۆرەپیاگ؛ کاوراکەی بێنمووت ☰ مردک

**مێردی** / mêrdî/: ناو. مێرینی: ١. پیاوەتی؛ جوامێزی ٢. قەوەتی جینسی پیاو ☰ ١. مردانگی ٢. نیروی جنسی مرد

**مێرغوزار** / mêrğuzar/: ناو. مێرخوزار؛ چیمەن؛ مێرگ و گیاجاڕ ☰ مرغزار

**مێرک** / mêrik/: جێناو. کاورا؛ کابرا 🇮🇷 يارو

**مێرکوت** / mêrkut/: ناو. کوتکی دارین 🇮🇷 پُتک چوبين

**مێرکوژ** / mêrkuj/: ناو. پیاوکوژ؛ گوژەر ‹سەردارەکی پر خوینخوار/ مێرکوژەکی دین و هار «جگەرخوێن»› 🇮🇷 آدمکش

**مێرگ** / mêr(i)g/: ناو. چیمەن؛ گیاجاڕ ‹دێم بەرەو ئەو دار و بەرد و بەندەنە/ دێم بەرەو ئەو باخ و مێرگ و چیمەنە «هێمن»› 🇮🇷 چمن؛ چمنزار

**مێرگوڵان** / mêrgułan/: ناو. گولشەن؛ باخی گول 🇮🇷 گُلشن

**مێرگۆڵە** / mêrgołe/: ☜ **مێرگەلان**

**مێرگە** / mêrge/: ناو. سوڕسوڕە؛ سوڕڕەمێرگە 🇮🇷 زردەپره مزرعه

**مێرگەپان** / mêrgepan/: ناو. دەشتی پان و بەرین و پڕ گژ و گیا 🇮🇷 دشت وسيع و سرسبز

**مێرگەسار** / mêrgesar/: ناو. شوێنێ کە مێرگی زۆره 🇮🇷 مرغزار گُسترده

**مێرگەلان** / mêrgelan/: ناو. مێرگۆڵە؛ مێرگی پچووکی زۆر بەدیمەن 🇮🇷 سبزەزار کم‌وسعت و زيبا

**مێرمناڵ** / mêrm(i)nał/: ☜ **مێرمنداڵ**

**مێرمنداڵ** / mêrmindał/: ناو. مێرمناڵ؛ تازەلاو؛ مێردمناڵ؛ مێردمنداڵ؛ کەسێ کە تازە سەردەمی منداڵی تێپەڕ کردووە 🇮🇷 نوجوان

**مێرمەندۆک** / mêrmendok/: ناوەڵناو. نێرەمووک؛ نەنێر نەمێ 🇮🇷 مُخنث؛ نه نر نه ماده

**مێروچێر** / mêr û çêr/: ناو. دۆست و ئاشنا 🇮🇷 دوست و آشنا

**مێرۆ** / mêro/: ☜ **مێروله**

**مێرۆژ** / mêroj/: ناو. ڕاوەکەو لە کاتی کورک بوونی ماکەودا 🇮🇷 شکار کبک هنگام کرچ شدنش

**مێروو** / mêrû/: ☜ **مێروله**

**مێرووچە** / mêrûçe/: ☜ **مێروله**

**مێرووژانە** / mêrûjane/: ناو. ژانی کەم و جاربەجار 🇮🇷 درد خفيف و مکرر

**مێرووستان** / mêrûstan/: ناو. شارە مێروو؛ شارەمرۆچە 🇮🇷 لانەی مورچەها

**مێروولە** / mêrûle/: ناو. مرۆچە؛ مرووچە؛ مرووژە؛ مرووێژ؛ مریچە؛ مژلۆر؛ مژلۆک؛ مژلەور؛ ملۆچکە؛ ملۆرە؛ مۆجلا؛ مجلەور؛ مۆجلە؛ مۆرجلە؛ مۆرجلا؛ مۆرجەلا؛ مۆری؛ مۆریلە؛ مۆژلا؛ مۆژلە؛ موورگ؛ مووری؛ مەرژوەل؛ مەرێژ؛ مێرۆ؛ مێروو؛ مێللوورە؛ مێلوورە؛ مێلوورە؛ مێرۆ؛ مێروو؛ مێری؛ مێرووچە؛ مرۆچلە؛ مەلوورە؛ مرووژ؛ مرێژ؛ مروژە؛ موور؛ مۆرزەلا؛ مجلەوەر؛ گێرک؛ تیرەیەکی گەورە لە مێروانی ناسکباڵ بە لەشی سێبەشی: سەر، سینە و زگەوە، لە ئەندازەی ٢ تا ١٨ میلیمیتر و بە ڕەنگی زەرد، سوور، قاوەیی و ڕەشەوە کە بە کۆمەڵ دەژین 🇮🇷 مورچه

⊡ **مێروولە کردن**: ١. تەزینی ئەندام ٢. وردیلە بلق هاتنە سەرێ لە ئاوی نزیک کولاندا 🇮🇷 ١. مور ـ مور شدن اندام ٢. حالت پيش از غُل زدن آب

**مێروولەترکانە** / mêrûletirkane/: ☜ **مێرولەعەجەمانە**

**مێرولەعەجەمانە** / mêrûle'ecemane/: ناو. مێروولەترکانە؛ جۆرێک مێروولەی گەورەیە لە جیاتی دانەوێڵە، مێرووی مردوو دەخوا 🇮🇷 مورچەی اسبی

**مێرەقنج** / mêreqinc/: ناو. *[کنایە]* هەنگ؛ هەنگەژاڵە 🇮🇷 زنبور عسل

**مێرەکی** / mêrekî/: ☜ **مێرانە**

**مێرەگان** / mêregan/: ناو. جەژنێکە لە سەرەتای گول دانی گەنمدا دەگیرێ 🇮🇷 مهرگان

**مێرەوان** / mêrewan/: ☜ **میهرەبان**

**مێرەوانی** / mêrewanî/: ناو. خۆشەویستی 🇮🇷 مهربانی

**میری** / mêrî/: ☜ **میروله**

**میریتی** / mêrîtî/: ناو. مەردایەتی؛ جوامێری ≚ مردانگی

**میریژان** / mêrîjan/: ناو. گیا دۆکلیویکە ≚ گیاهی آشی

**میریڤان** / mêrîvan/: ناوەڵناو. ۱. خۆشەویست ۲. ☜ **میهرەبان** ≚ ۱. محبوب ۲. ☜ **میهرەبان**

**میرێنی** / mêrênî/: ☜ **مێردی**

**میرِیای** / mêřyay/: چاوگ. شکان؛ شکیان ≚ شکستن

**میرێ** / mêřê/: ناو. زڕدایک؛ باوەژن ≚ نامادری

**میز** / mêz/: ناو. ۱. ☜ **میز**[1] ۲. باوەش؛ ئامێز ≚ ۱. ☜ **میز**[1] ۲. آغوش

**میزان** / mêzan/: چاوگ. میزتن ≚ شاشیدن

**میزاندن** / mêzandin/: چاوگ. مەیزین؛ داهێشتن ≚ شاشاندن

**میزتن** / mêztin/: ☜ **میزتن**

**میزدان** / mêzdan/: ☜ **میزەڵدان**

**میزکاڵ** / mêzkał/: ☜ **میز**[1]**ـ۱**

**میزن** / mêzin/: ناوەڵناو. *[پلار]* دەڵەمیز؛ تایبەتمەندی کەسێ زۆر دەمیزێ ≚ شاشو

**میزە** / mêze/: ناو. مەیز؛ تماشا؛ تواشا ≚ تماشا

⊡ **میزە کرن:** مەیزین؛ لێڕوانین؛ فت کردن ≚ نگاه کردن

**میزەچورتکە** / mêzeçurtke/: ☜ **میزەچورتکێ**

**میزەچورتکێ** / mêzeçurtkê/: ☜ **میزەچورتکێ**

**میزەر** / mêzer/: ناو. میزەرە؛ شاشک؛ سەروپێچ ≚ عمامە

**میزەربەسەر** / mêzerbeser/: ناوەڵناو. میزەرەبەسەر؛ میزەرەوەسەر؛ سەروپێچدار ‹کابرایەکی میزەربەسەر هات و دانیشت› ≚ عمامە بە سر

**میزەرە** / mêzere/: ☜ **میزەر**

**میزەرەبەسەر** / mêzerebeser/: ☜ **میزەربەسەر**

**میزەرەوەسەر** / mêzereweser/: ☜ **میزەربەسەر**

**میزەفک** / mêzefik/: ناو. مەزفک؛ میزفک؛ پلووسک؛ لووس؛ لووساوک ≚ ناودان

**میزەک** / mêzek/: ناوەڵناو. *[پلار]* کەلمیز؛ دەڵەمیز؛ دەڵەمێز؛ گمێزن ≚ شاشو

**میزەڵ** / mêzeł/: ☜ **میزەڵ**

**میزیان** / mêzyan/: ☜ **میزتن**

**میزین**[1] / mêzîn/: ناو. ۱. کۆ ئەستێرەیەکە لە عاسمان کە وەک تەراز دەچێ ‹پێور و میزین پێرگی هەڤ بوون› ۲. جانتا؛ ساک؛ خورجینی پچووک ≚ ۱. بُرج میزان ۲. ساک دستی

**میزین**[2]: ئامراز. بەرانبەری ≚ مقابلِ

**میژ** / mêj/: ناو. ۱. مژ؛ ملک ۲. نوێژ؛ ئەرکی پێنج فەرزەی موسوڵمان لە ڕۆژ و شەودا ≚ ۱. مُک ۲. نماز

⊡ **میژ کردن:** نوێژ کردن ≚ نماز گزاردن

**میژان** / mêjan/: ☜ **مژین**

**میژاندن** / mêjandin/: چاوگ. کەم ـ کەم شیری ئاژەڵ دان بە بێچوو لە وەختی دۆشیندا تا باشتر شیر دادا ≚ کم ـ کم شیر دادن بە بچەی دام هنگام دوشیدن تا راحت دوشیده شود

**میژبێژ** / mêjbêj/: ناو. چیرۆکڤان؛ حەقایەتخوان ≚ قصەگو

**میژتن** / mêjtin/: ☜ **مژین**

**میژک**[1] / mêjik/: ناو. کاندۆ؛ گویلپارێ کە دایکی دەمژێ ≚ پارینەی شیرخوار

**میژک**[2]: ناوەڵناو. *[کنایە]* زۆرخۆری تێرنەخۆر ≚ پُرخور

**میژکەر** / mêjker/: ناو. نوێژکەر؛ نوێژخوێن؛ نڤێژکەر ≚ نمازگزار

**میژگە** / mêjge/: ☜ **مزگەوت**

**میژورد** / mêjwird/: ناو. گیادانە؛ گیایەکە گوڵی شین دەکا و زۆر لەوەڕی چاکە ≚ گیاهی با گل‌های آبی

**مێژوک** / mêjuk/: ناو. شانەی نەرم و پفەڵی ناو ئێسک کە لە لاواندا خانەی خوێنسازی تێدایە و لەگەڵ هەڵکشانی تەمەن، چەوری پڕی دەکاتەوە ☰ مغز استخوان

**مێژوەرد** / mêjwerd/: ☜ مژیوەر

**مێژوی** / mêjwî/: ☜ مەرزی

**مێژوین** / mêjwîn/: ناو. نیسکێنە؛ چێشتی مێژوی ☰ آش عدس

**مێژوێ** / mêjwê/: ناو. نیسک؛ نژی؛ نوژوی ☰ عدس

**مێژو** / mêjo/: ناوەڵناو. بەرەکەتی؛ لایەق ☰ شایستە

**مێژورد** / mêjord/: ☜ مژیوەر

**مێـژۆک** / mêjok/: ناوەڵناو. تایبەتمەندی بێچـووە ئاژەڵێ کـە گـوانی بێجگـە دایکیشـی دەگـرێ ☰ ویژگی بچه دامی که پستان جُز مادرش را نیز می‌گیرد

**مێژوکە** / mêjoke/: ناو. بەرخی تـازەزاو ☰ برّەی تازه متولد شده

**مێژوو** / mêjû/: ناو. تاریخ: ١. کات؛ سات؛ وەخـت بە پێی ڕۆژ، مانگ و ساڵ ‹مێـژووی زەماوەندەکـە دیاری بکەن› ٢. ڕێکەوت؛ کاتی نووسـراوەی نێـو بەڵگەیەک ‹دوو پەڕە چەکم بـە مێـژووی هەوەڵـی پووشپەڕ وەرگرت› ٣. کاتی یەک ڕووداو ‹مێـژووی کۆچی دوایی› ٤. سەرەتای مێژوو ‹مێژووی کۆچی ـــ هـەتاوی› ٥. دێـرک؛ دیـرۆک؛ لقێـک لـە زانسـتگەلی مرۆڤـانی لەمـەڕ تۆمـار کـردن و لێکدانـەوەی ڕووداوی تایبـەت بـە سـەردەمانی ڕابردووەوە ‹زانستی مێژوو› ٦. لقێـک لـە زانسـتە مرۆڤییەکان کە دەپەرژێتە سـەر تۆمـار کـردن و لێکدانەوەی ڕابردوان ‹هەردووکمان، وەک سەرمان، عەشق ئەنێین بە عەشقی یەکەوە/ مێژوومان داپیرە و هۆنراوەیش ئەکەینـە ئـاگردان «شـێرکۆ»› ☰ ١تـا٦ تاریخ

**مێژوبێـژ** / mêjûbêj/: نـاو. دیرۆکڤـان ☰ نقـال رویدادهای تاریخی

**مێژووزان** / mêjûzan/: ☜ مێژووناس

**مێژووشناس** / mêjûş(i)nas/: ☜ مێژووناس

**مێژووڤان** / mêjûvan/: ☜ مێژووناس

**مێژووناس** / mêjûnas/: ناو. مێـژووزان؛ مێژووڤـان؛ مێژووشناس؛ زانا بە دەنگ و باسـی ڕابـردوان ☰ مؤرخ

**مێژوویی** / mêjûyî/: ناوەڵناو. زۆر کەونارا ☰ تاریخی

**مێـژەلاک** / mêjełak/: نـاو. ١. ☜ مێشك ـ١ ٢. هێشووە ترێی بێدەنـک ☰ ١. ☜ مێشك ـ١ ٢. خوشەی انگور بی دانه

**مێژەڵۆک** / mêjełok/: ناو. مـەورە؛ مێـوژەڵ؛ لکـی براوی ڕەز ☰ شاخەی هرس‌شدەی تاک

**مێژی** / mêjî/: ☜ مێشك ـ١

**مێژیـل** / mêjîl/: نـاو. مـزڵ؛ قۆنـاخ؛ مـەودای ڕۆژەڕێیەکی بە پا ☰ یکروزه راه پیاده

**مێژین** / mêjîn/: ☜ مژین

**مێژینە** / mêjîne/: ناو. پێشـینە؛ ڕابـردوو؛ ڕابـردە؛ زانیاری لەمەڕ بەسەرهاتی کـەس یـان شـتێکەوە ‹مێژینەی شەڕی عەرەب و کورد› ☰ پیشینه؛ سابقه

**مێس** / mês/: ☜ مێش ـ١

**مێش** / mêş/: ناو. ١. مەش؛ مەشی؛ مەشە؛ مەگـەز؛ مەیەز؛ مەگەس؛ مەخشی؛ مڵس؛ مێس؛ مەیس ٢. محانج؛ کاری هاویشتنی بێئامانج دەبەر چاو گرتن لـە کەلاینـدا ٣. هـەنگ؛ مێشـەنگوین ٤. *[کینایە]* هێزی کار و چالاکی ☰ ١. مگـس ٢. پرتـاب بـدون هدف‌گیری در تیله‌بازی ٣. زنبور عسل ۴. توانایی

▣ **مێش تێدان**: کرمێ بـوونی مێـوەی بێسـتان ☰ کرم زدن میوەی پالیزی

**مێش خەساندن**: *[مەجازی]* مـێش قەپانـدن؛ گـون تەقاندن؛ بێکار ڕابواردن ☰ علاف بودن

**مێش قەپاندن**: ☜ مێش خەساندن

**مێش کردنە گامێش**: *[مەجازی]* کێچ بە گا کردن ☰ از کاه کوه ساختن

**مێشاسه** / mêşase/: ☜ **مێشەسەگانە**

**مێشاکەران** / mêşakeran/: ☜ **مێشەکەرانە**

**مێشان** / mêşan/: ☜ **مێشێن**

**مێشانه** / mêşane/: ☜ **مێشانی**

**مێشانی** / mêşanî/: ناو. مێشانە؛ ترسی گا و گوێل لە مۆز ☲ رم گاو و گوساله از زنبور درشت

⊡ **مێشانی کردن**: مۆز کردنی گا و گوێل ☲ رمیدن گاو و گوساله از زنبور درشت

**مێشپەڕ** / mêşpeř/: ناو. ڕەز لە خونچەدا، بەر لە پشکووتن ☲ تاک قبل از شکوفه

**مێشتن** / mêştin/: ☜ **مژین**

**مێشخۆر** / mêşxor/: ناو. کاسەڵەشینە؛ زەردەواڵەخۆر ☲ سبزقبا

**مێشخۆرکه** / mêşxorke/: ☜ **مێشخۆره**

**مێشخۆره** / mêşxore/: ناو. مێشخۆرکە؛ کەندەسمە؛ مەلێکی جوان و چەند ڕەنگە ☲ زنبورخوار

**مێشڕەوێن** / mêşřewên/: ناو. بەرچاویلە؛ بەرچاوکەی یەکسم لە ترسی مێش ☲ پیشانی‌بند پرزدار اسب و ستور

**مێشک** / mêşk/: ناو. ١. مژگ؛ مژی؛ مەزگ؛ مەژک؛ مەژگ؛ مەژۆ؛ مەژوو؛ مەژی؛ مەشکە؛ مەغز؛ موخ؛ مێژەلاک؛ مێژی؛ بەشێ لە کۆئەندامی دەماری ناوەندی بڕبڕەداران کە ئێسکی کاپۆڵ دایگرتووە ٢. ☜ **مۆز۱و٤** ☲ ١. مغز ٢. ☜ **مۆز ۱و٤**

⊡ **مێشکی کەسێک داتەکاندن**: *[مەجاز]* زۆربلەیی کردن و بوونە هۆی سەرێشەی کەسێک ☲ وراجی کردن و سر کسی را درد آوردن

**مێشکاسەی** / mêşkasey/: ☜ **مێشەسەگانە**

**مێشکوژ** / mêşkuj/: ناو. ١. دەرمان و گیایەکە مێشی پێدەکوژن ٢. تەنراوێکە لە شووڵ بۆ مێش کوژتن ☲ ١. داروی مگس‌کش ٢. مگس‌کش دستی

**مێشکوشک** / mêşkwişk/: ناوەڵناو. *[مەجاز، پلار]* بیرتەسک؛ کورتبین ☲ تنگ‌نظر

**مێشکۆڵه** / mêşkołe/: ناو. زۆپایی پشتەسەر ☲ برآمدگی پس سر

**مێشگر** / mêşgir/: ناو. مێشگرە: ١. دەرمانێ کە مێشی پێوە دەلکێ ٢. *[کینایە]* تەمەڵ و بێکار ☲ ١. نوار مگس‌گیر ٢. تنبل و بیکار

**مێشگره** / mêşg(i)re/: ناو. ١. ☜ **مێشگر** ٢. ☜ **مۆزگره**

**مێشلەزەرگون** / mêşlezergun/: ☜ **مێشلەزەرگه**

**مێشلەزەرگۆ** / mêşlezergo/: ناو. دەوەنێکە ☲ درختچه‌ای است

**مێشلەزەرگه** / mêşlezerge/: ناو. مێشلەزەرگون؛ گیایەکی گەلاپانە ☲ از گیاهان دارویی

**مێشمێشک** / mêşmêşik/: ناو. قومارێکە هەرکەس زووتر مێش لە هێلکە کولاوەکەی بنیشێ ☲ از بازی‌ها

**مێشن** / mêşin/: ناو. ١. تیماج؛ پێستی بزن و مەڕی لە دەباغدراو ٢. ☜ **مەڕ۱** ☲ ١. تیماج ٢. ☜ **مەڕ۱**

**مێشنا** / mêşna/: ☜ **مەڕ۱**

**مێش‌ومحانج** / mêş û m(i)ĥanc/: ناو. ئاویتنی بێئامانج ☲ پرتاب بدون هدفگیری

**مێشۆ** / mêşo/: ناوەڵناو. حۆل؛ نەفام ☲ هالو

**مێشۆک** / mêşok/: ناو. مێشی بچووک ☲ مگس کوچک

**مێشۆکی** / mêşokî/: ناوەڵناو. تایبەتمەندی هەرچی زۆری مێش لێ بنیشێ ☲ ویژگی هرچه که مگس بسیار بر آن نشیند

**مێشوله** / mêşûle/: ناو. پێشکە؛ پێشی ☲ پشه

**مێشه** / mêşe/: ناو. ١. بێشە؛ دەحل؛ دارستانی بی لە دەم چەم ٢. مێشانە؛ ترس و هەلاتنی ولاغ و یەکسم لە مۆز ☲ ١. بیشه‌ی انبوه از درختان بید ٢. رمیدگی حیوانات از زنبور و مگس

**مێشەخانمانە** / mêşexan(i)mane/: ناو. جۆرێک مێشی سەوزی گەورەیە ✠ نوعی مگس سبز بزرگ

**مێشەڕۆ** / mêşeřo/: ناو. یەکسمی هەلاتوو لە تاوی مێش و مەگەز ✠ ستور رم‌کردە از مگس و زنبور

**مێشەڕەوی** / mêşeřewî/: ناو. /کنایە/ بێکاری؛ کاری مێش قەپاندن ✠ بیکاری

**مێشەسانە** / mêşesane/: ☜ مێشەسەگانە

**مێشەسەگانە** / mêşesegane/: ناو. مێشاسەیە؛ مێشەسەیە؛ مێشکاسەی؛ مێشەسانە؛ مێشەسەیانە؛ جۆرێ مێرووی باڵداری بۆرە زۆر دەوری سەگ دەدا ✠ سگ‌مگس

**مێشەسەیانە** / mêşeseyane/: ☜ مێشەسەگانە

**مێشەسەیە** / mêşeseye/: ☜ مێشەسەگانە

**مێشەسی** / mêşesî/: ناو. چێرگ؛ چرگ ✠ هوبرە

**مێشەڤان** / mêşevan/: ☜ مێشەوان ـ١

**مێشەقەبرە** / mêşeqebre/: ناو. مێشێکی درێژووکەی سەوزە لە بن زەمیندا هێلانە دەکا ✠ از انواع مگس

**مێشەکەران** / mêşekeran/: ☜ خەرمەگەز

**مێشەکەرانە** / mêşekerane/: ناو. مەوزک؛ مۆزەشینە؛ مێشاکەران؛ کەرمێش؛ مۆزەشینە کە گا و گۆل ڕاو دەنێ ✠ خرمگس

**مێشەگرە** / mêşeg(i)re/: ☜ مێشەگیرە

**مێشەگیرە** / mêşegîre/: ناو. مێشەگرە؛ جاڵجاڵۆکە؛ جۆلاتەنە؛ کاکڵەمووشان ✠ عنکبوت

**مێشەڵان** / mêşełan/: ناو. بێشەی چوغور؛ دەحلی پڕ؛ بێشەڵان ✠ بیشەی انبوە .

**مێشەنگڤ** / mêşengiv/: ☜ مێشەنگوین

**مێشەنگوین** / mêşeng(i)wîn/: ناو. مێش‌هەنگوین؛ هەنگ؛ مێشەنگوێن؛ مێش‌هەنگ؛ مێش‌هنگوڤ؛ مێشەنگڤ؛ مێشی لیکاو شیرنی چزوودار ✠ زنبور عسل

**مێشەنگوێن** / mêşeng(i)wên/: ☜ مێشەنگوین

**مێشەوان** / mêşewan/: ناو. ١. مێشەڤان؛ ئاگاداری مێشە ٢. هەنگەوان؛ ئاگاداری هەنگ ✠ ١. جنگلبان ٢. زنبوردار

**مێش‌هنگوڤ** / mêşhinguv/: ☜ مێشەنگوین

**مێش‌هەنگ** / mêşheng/: ☜ مێشەنگوین

**مێش‌هەنگوین** / mêşheng(i)wîn/: ☜ مێشەنگوین

**مێشێن** / mêşên/: ناو. مووشانێ؛ مووشێن؛ مەرمەڕۆکێ؛ مەرمەڕێن؛ هەڵماتان؛ میتێن؛ میشانێ؛ مێشان؛ کەلایێن؛ پلان ✠ تیلەبازی

**مێڤان** / mêvan/: ☜ میوان

**مێڤاندار** / mêvandar/: ☜ میواندار

**مێڤانداری** / mêvandarî/: ☜ میوانداری

**مێڤانی** / mêvanî/: ☜ میوانی

**مێڤۆک** / mêvok/: ☜ مێوک

**مێقن** / mêqin/: ناو. سەر و سەکوت؛ بیچم و تەرح ✠ ریخت؛ قیافە

**مێکوتک** / mêkutik/: ☜ مێکوتە

**مێکوتە** / mêkute/: ناو. مێکوتک؛ دڕکە؛ خوریکەی مریشک؛ نەخۆشییەکی گیرۆی ڤایرۆسییە دەبێتە هۆی دەردانی هاوڵەی وردی ئازاردەر لە سەر پێست و پتر لە منداڵاندا ڕوو دەدات ✠ آبلەمرغان

**مێکوک** / mêkûk/: ☜ مێکوکە

**مێکوکە** / mêkûke/: ناو. مێکووک؛ بەلەک ✠ شیرین‌بیان

**مێکەر** / mêker/: ☜ ماکەر

**مێکێ‌ئاڤێ** / mêkê 'avê/: ☜ میاناڤێ

**مێگوان** / mêg(i)wan/: ناو. مێنگوین؛ نێنگوون؛ دامنەچەقان؛ بەرکەڵی مانگا ✠ تلیسە؛ گوسالەی مادە سەسالە

**مێگەل** / mêgel/: ناو. گەلە؛ کەرک ‹شەنگەبێری گراوی خۆم، وینووسی جەماڵ و جوانی!/ ئێستاش پاڵێنێ وەک جاران لە شوان و مێگەل دەڕوانی؟ «هێمن»› ✠ گلە؛ رمە

**مێگەڵوان** / mêgelwan/: ☜ **مێگەلەوان**

**مێگەلەوان** / mêgelewan/: ناو. مێگەڵوان؛ شوانی گەلە ☰ چوپان

**مێل** / mêl/: ئاوەڵناو. لارەوەبوو؛ داهاتوو ☰ کجشدە؛ مایل

**مێلاق** / mêlaq/: ☜ **مێلاقە**

**مێلاقە** / mêlaqe/: ناو. مێلاق: ١. ئانگوو؛ ترێی هەڵگیراو بۆ زستان ٢. ڕەبەنۆک؛ گوڵێکی سووری ئاڵە ☰ ١. انگور نگهداری شدە برای زمستان ٢. آلالە

**مێلاک** / mêlak/: ناو. میلاک؛ مێلاک؛ جگەر؛ جەرگ ‹خوێن تێ ژڤان داغێن و کول/ کەرـ کەر دبت مێلاک و دل «جگەرخوێن»› ☰ جگر

**مێلاگ** / mêlag/: ناو. کاری ڕوون کردنەوە؛ سەلماندن ☰ اثبات

**مێلکدان** / mêlikdan/: ناو. کلدان؛ سورمەدان ☰ سُرمەدان

**مێللورە** / mêllûre/: ☜ **مێرولە**

**مێلوک** / mêluk/: ناو. شیرینبەلەک؛ شیرینبەیان؛ بەلەک ☰ شیرینبیان

**مێلۆ** / mêlo/: ☜ **هەلۆرک**

**مێلۆدرام** / mêlod(i)ram/: ناو. بەرهەمی شانۆیی (شانۆنامە، فیلمنامە، شانۆ یان فیلم) وێڕای جرتوفرتی (وەک: هەڵپەڕکێ، گۆرانی، هەرا، گریان و پێکەنین) زۆرتر لە ڕادەی ئاسایی ☰ ملودرام

**مێلۆدی** / mêlodî/: ناو. *[مووسیقا]* ئاهەنگ؛ نەغمە؛ دوابەدوایی چەند دەنگی مووسیقایی (سازی یان ئاوازی) بە شێوەیەک کە بەشێکی تەواو پێکبێنن ☰ ملودی

**مێلورە** / mêlûre/: ☜ **مێرولە**

**مێڵ** / mêł/: ☜ **میل**

**مێڵاک** / mêłak/: ناو. ١. جەرگ و هەناو ٢. کەوچک؛ کەفچی ٣. چێژە؛ کاری چەشتن ☰ ١. دل و جگر ٢. قاشق ٣. عمل چشیدن

⊡ **مێڵاک نەکردن**: مەلاک نەکردن؛ تام نەکردن ‹قەسەم بە خوا مێڵاکی ناکەی!› ☰ چشیدن

**مێڵاو** / mêław/: ناو. لاسکی قلیاناوی کە سەرێکی دەگاتە ناو ئاوەکەی ☰ میلەی قلیان

**مێڵورە** / mêłûre/: ☜ **مێرولە**

**مێڵە** / mêłe/: ☜ **میل**

**مێڵەدە** / mêłede/: ناو. مێلیدە؛ چۆلەچرا؛ مەشخەڵ ☰ مشعل

**مێلیدە** / mêlîde/: ☜ **مێڵەدە**

**مێمان** / mêman/: ☜ **میوان**

**مێمانی** / mêmanî/: ☜ **میوانی**

**مێمبەر** / mêmber/: ناو. ڕیخۆڵە باریکە ☰ رودەی کوچک

**مێمڵ** / mêmił/: ناو. ١. بەڵا؛ ئافەت ٢. سپڵ ☰ ١. آفت ٢. طحال

⊡ **بوونە مێمڵی کەسێ/ شتێ**: بوونە دژی کەسێ/ شتێ ☰ بلای جان کسی/ چیری شدن

**مێموک** / mêmûk/: ناو. مێکووک؛ بەلەک ☰ گیاە شیرینبیان

**مێنگ** / mêng/: ☜ **مێنگە**

**مێنگون** / mêngun/: ☜ **مێنگوین**

**مێنگوین** / mêng(i)wîn/: ناو. مێنگون؛ دامنەچەقان؛ مانگای بەرکەڵ ☰ تلیسە؛ مادەگاو سەسالە

**مێنگە** / mênge/: ناو/ ئاوەڵناو. مێنگ؛ مێ؛ مێوینە؛ ما؛ مان ☰ مادینە

**مێنە** / mêne/: ناو. پشت؛ پشتەوە ☰ پُشت

**مێنەکە** / mêneke/: ناو. ئەنگوستیلەی بێنقێم لە شاخە بزن ☰ انگشتر بینگین از شاخ بُز

**مێو** / mêw/: ناو. ١. مێ؛ ما؛ ماینە ٢. شەم؛ شەمێ؛ مۆم ٣. مەو؛ ڕەز؛ داری ترێ ٤. برکە بێستان ٥. دالووت؛ قایمە مێو کە داری مێوی دەخریتە سەر ☰ ١. مادینە ٢. موم ٣. تاک ۴. بوتەی پالیزی ۵. داربست درخت مو

⊡ **مێو برین**: برین و کەندنەوەی لق‌وپۆپی دارمێـو لە سەرەتای بەهاردا 🇮🇷 هرس کردن تاک

**مێو دان**: گشـتەک دە مـۆم سـاوین 🇮🇷 رشـتە را موم‌اندود کردن

**مێو گرتن**: بەرگی مۆم دەبەر شتێ کردن 🇮🇷 موم اندود کردن

**مێوان** / mêwan/: ☜ **میوان**

**مێوانخانە** / mêwanxane/: ☜ **میوانخانە**

**مێوانڕاگر** / mêwanřagir/: ناوەڵناو. وجـاخ‌ڕوون؛ نان‌بدە 🇮🇷 مهماندوست

**مێوانی** / mêwanî/: ☜ **میوانی**

**مێوایەتی** / mêwayetî/: نـاو. مایـک؛ مایکـەی؛ بەرانبەری نێرایەتی 🇮🇷 مادگی

**مێوخۆرکە** / mêwxorke/: نـاو. گیایەکـە مێملـی دارمێوە وەک ماڵۆچە وایە و مێوەکە وشک دەکا 🇮🇷 آفت گیاهی تاک

**مێـورە** / mêw(i)re/: نـاو. سـاقەتەی دار مێـو 🇮🇷 ساقەی تاک

**مێوڕۆن** / mêwřon/: ☜ **مێوەڕۆن**

**مێوژ** / mêwij/: نـاو. مـاویژ؛ مـۆوژ؛ مەڤـیژ؛ مـەووژ؛ مەویژ؛ مێویژ؛ ترێی لە بەر تاو ئیشکەوەکراو 🇮🇷 مویز

**مێوژۆرد** / mêwjord/: ☜ **مژیوەر**

**مێوژۆکـە** / mêwjoke/: نـاو. ۱. لکـی داری داردەمووکانە ‹وەک مێوژۆکە دەلەرزێ› ۲. بـنی گیایەکە بە قەد گێوژ زارۆ دەیخۆن 🇮🇷 ۱. شاخەی درختچەی مویزک ۲. ریشەی خوردنی نوعی گیاه

**مێـوژەسـورکە** / mêw(i)jesûrke/: نـاو. سـوورکە؛ جۆرێ مێوژ 🇮🇷 نوعی کشمش

**مێوژەڵ** / mêwjeł/: ☜ **مێژەڵۆک**

**مێوک** / mêwik/: نـاو. مێڤـۆک؛ دوگمـە؛ قۆپچـە؛ بشکۆژ 🇮🇷 دُکمە

**مێولەسەر** / mêw le ser/: نـاو. جۆرێ فیشـەک 🇮🇷 نوعی فشنگ

**مێون** / mêwin/: ناو. مێو؛ ناوەند؛ دوڕ 🇮🇷 مابین؛ میان

**مێوە** / mêwe/: ناو. ۱. ☜ **میوە** ۲. ☜ **مێ[1]ـ۱**

**مێوەت** / mêwet/: ناو. خزمەت؛ ڕاژە 🇮🇷 خدمت

**مێوەجاخی** / mêwecaxî/: نـاو. ژن و مێـردێ کـە هەر کچیان دەبێ 🇮🇷 زن و شوهر دخترزا

**مێوەرد** / mêwerd/: ناو. کـاری تـۆم چانـدن دوای هەوەڵ بارانی پاییز 🇮🇷 کاشـت بعـد از اوّلـین بـاران پاییزی

**مێوەڕۆن** / mêweřon/: ناو. مێوڕۆن؛ جۆرێ مەڵهەم لە ڕۆن و مێو 🇮🇷 مرهمِ روغن و موم

**مێوەلە** / mêwele/: ☜ **مێ[1]ـ۱**

**مێوەڵە** / mêweļe/: ☜ **مێ[1]ـ۱**

**مێوەمارانـە** / mêwemarane/: نـاو. جـۆرێ کاڵەکەمارانە 🇮🇷 نوعی هندوانەی ابوجهل

**مێویژ** / mêwîj/: ☜ **مێوژ**

**مێوین** / mêwîn/: ناوەڵناو. لە مێو چێ‌کری 🇮🇷 مومی

**مێوینـە** / mêwîne/: نـاو. ۱. ☜ **مـێ[1]ـ۱** ۲. مشەمای مێودراو 🇮🇷 ۱. ☜ **مێ[1]ـ۱** ۲. مُشمع

**مێوینەیی** / mêwîneyî/: نـاو. دۆخـی مـێ بـوون 🇮🇷 مادگی

**مێه** / mêh/: ☜ **مەڕـ۱**

**مێهتن** / mêhtin/: ☜ **مژین**

**مێهرەجـان** / mêhrecan/: نـاو. میهرەجـان؛ مهرەجـان؛ مێرەگـان؛ مێهرەگـان؛ فسـتیواڵ؛ جـەژنێکی فەرهـەنگی کـە لـە ماوەیـەکی دیاریکراودا بەڕێوە دەچێ 🇮🇷 جشنوارە

**مێهرەگان** / mêhregan/: ☜ **مێهرەجان**

**مێهڤانیـک** / mêhvanîk/: نـاو. چوارمەشـقان؛ چوارمشقی 🇮🇷 چهارزانو

**مێینە** / mêyne/: ☜ **مێ[1]ـ۱**

**مێیە** / mêye/: ناو. ۱. ☜ **مـێ[1]ـ۱** ۲. ئاڵـقەی قرتە 🇮🇷 ۱. ☜ **مێ[1]ـ۱** ۲. حلقەی سگک

**مێیینە** / mêyîne/: ☜ **مێ[1]ـ۱**

# ن

**ن** / n/: پت. نیشانەی بیستوحەوتەمین پیتی ئەلفوبێی زمانی کوردی ن؛ نشانەی حرف بیستوهفتم الفبای زبان کُردی

**ن**[١] / ni/: ناو. ناوی پیتی بیستوحەوتەمی ئەلفوبێتکەی کوردی ن؛ حرف بیستوهفتم الفبای کُردی

**نـ**[٢]: پێشگر. نیشانەی نەفی: ١. لە فیعلدا؛ نا ‹نزانم؛ نبیژم› ٢. لە چاوگدا؛ نە ‹نەهشتن؛ نقارین› ٣. لە ئاوەڵناودا؛ نا ‹نچار؛ نەهش› ٤. لە ئاوەڵکاردا؛ نا ‹نکاو› نـ؛ منفی‌ساز: ١. فعل ٢. مصدر ٣. صفت ۴. قید

**ـن**[١] / -in/: جێناو. شناسەی لکاو بۆ: ١. فەرمان لە دووهەم کەسی کۆدا ‹بخۆن؛ بڕۆن؛ بێنن› ٢. کاری دووهەم و سێهەم کەسی کۆی ڕابردووی سادە ‹هاتن؛ کەوتن؛ مردن› ٣. ـ مان؛ ئێمە؛ خاوەندی یەکەم کەسی کۆ ‹بۆن بێنە؛ لێن گەڕێ› ضمیر متصل: ١. ـید؛ امری دوم شخص جمع ٢. ـند؛ ماضی مطلق، دوم شخص وسوم شخص جمع ٣. ـان؛ ملکی اول شخص جمع

**ـن**[٢]: پاشگر. ١. لە ناو ئاوەڵناو دروست دەکا ‹چلکن؛ کولکن؛ بازن› ٢. لە ڕەگی کار ئاوەڵناو دروست دەکا ‹نکن؛ میزن؛ ترن› ٣. نیشانەی چاوگ ‹برن؛ خارن؛ چوون؛ مردن› ٤. ـ ی؛ نیشانەی ئاوەڵناوی نیسبی ‹زیڕن› ٥. ـ ین؛ ـ ینگ؛ ئاوەڵناوی تەرتیبی دروست دەکا ‹پاشن› ١. ـین؛ صفت‌ساز ٢. ـو؛ صفت‌ساز ٣. ن؛ نشانەی مصدر ۴. ـ ین؛ نشانەی صفت نسبی ۵. ـ ین؛ صفت‌ساز

**نا**[١] / na/: ناو. دۆلاش ‹سەری نای ئاسیاو› ناو آسیاب

**نا**[٢]: ئاوەڵکار. نە: ١. نیشانەی وەرام دانەوەی مەنفی ‹ـ تۆ خواردت؟ ـ نا› ٢. نیشانەی پێداگری ‹نا، هەر دەبێ بڕۆم!› ١. نەخیر؛ نە ٢. نە؛ نشانەی تأکید و اصرار

**نا**[٣]: ئامراز. نام: ١. ئان؛ یان؛ یام؛ نیشانەی لە نێواندا ‹نا تۆ بچۆ! نا من دەچم› ٢. کە؛ بۆ پەیوەند دان ‹ئەوانەی نا دێن کێن؟› ١. یا ٢. کە

**نا**[٤]: دەنگ. بۆ سەیر مان یان پەژارەی زۆر ‹ـ هەموو دارەکان سووتاون. ـ نا!› نە؛ صدای حاکی از شگفتی و حسرت

**نا**[٥]: پێشگر. ١. نیشانەی نەفی لە فیعلدا (ڕانەبردوو بە زۆرینە) ‹ناخۆم؛ نارۆن؛ ناچێ؛ ناکا› ٢. نیشانەی ئاوەڵناوی مەنفی ‹ناساز؛ ناپارێز› ٣. نیشانەی مەنفی کردنەوەی ئاوەڵناو یان ناو ‹ناپیاو؛ ناخۆرا› ٤. بۆ بێزاری دەربڕین پێش لە بڕێک ناو دێ ‹ناحەسەن؛ ناکاوە› ١. نـ ؛ منفی‌ساز فعل ٢. نا؛

نشانەی صفت منفی ۳. نا؛ منفی‌ساز اسم و صفت ۴. پیشوند تعریضی

**نائاسایی / na'sayî/**: ئاوەڵناو. سەیر؛ بەدەر لە دام و دەستوور ■ غیرعادی

**نائاشنا / na'aşna/**: ئاوەڵناو. بیانی؛ بیانە؛ نەشناس؛ نەژناس؛ نەناسراو؛ نەناسیاو ■ غریبه

**نائلاج / na'(i)łac/**: ☜ **ناچار**[1]

**نائومێد / na'umêd/**: ☜ **ناهومێد**

**نائەمین / na'emîn/**: ئاوەڵناو. ۱. غاین؛ خەیان؛ دەست‌پیس ۲. بڤە؛ خەتەر ■ ۱. دست‌کج ۲. ناامن

**نائەمینی / na'emînî/**: ناو. دەست‌پیسی ■ دست‌کجی

**نائەهل / na'ehl/**: ☜ **نادروست ـ۱**

**نائینسان / na'însan/**: ئاوەڵناو. نابەشەر؛ بە بێ ویژدان و هەستی مرۆڤانە ■ ضد بشر

**نابا / naba/**: ☜ **نایاب**

**ناباب / nabab/**: ☜ **ناباو**

**نابار / nabar/**: ئاوەڵناو. ۱. ناشیرین ۲. نەپۆر؛ بەدبار ‹دۆخی نابار› ■ ۱. بدریخت ۲. ناهنجار

**نابالغ / nabałiğ/**: ئاوەڵناو. نابالق؛ نەبالغ؛ هێشتا گەورە نەبوو ‹مندالی نابالغ› ■ نابالغ

**نابالق / nabałiq/**: ☜ **نابالغ**

**ناباو / nabaw/**: ئاوەڵناو. نایاب؛ نەباو: ۱. بێ‌برەو؛ بێ‌رمێن ۲. دوور لە داب و دەستووری کۆمەڵ ۳. نابار؛ دشت؛ ناشیرین ■ ۱. بی‌رواج ۲. نامُتداول ۳. زشت

**نابایس / nabayis/**: ئاوەڵناو. لە پێوست بە دوور ■ نابایسته

**نابو / nabû/**: ☜ **نابوت**

**نابوت / nabût/**: ئاوەڵناو. نابوو؛ نابوود: ۱. تێشکاو؛ لە دارایی کەوتوو ۲. پووتە؛ پووتەکە ‹کابرایەکی دزێوی نابووت داوای کچەکەی دەکرد› ۳. لەنێوچوو؛ تیاچوو ‹خەڵکیان تەواو نابووت کردا› ■ ۱. ورشکست ۲. کوتاەقد بدقواره ۳. نابود

◻ **نابوت بون**: ۱. لە دارایی کەوتن ۲. لە نێو چوون * هەروەها: **نابووت کردن** ■ ۱. ورشکست شدن ۲. نابود شدن

**نابوتە / nabûte/**: ئاوەڵناو. *[پلار]* پووتەکە؛ پیسەکە؛ قرخنە ■ کوتاەقد لاغر بدقواره

**نابوتی / nabûtî/**: ناو. ۱. نابوویی؛ چۆنیەتی لە دارایی کەوتن ۲. پووتەکەیی؛ قرخنی ■ ۱. ورشکستگی ۲. بدریختی و کوچک اندامی

**نابود / nabûd/**: ☜ **نابوت**

**نابونیک / nabûnîk/**: ناو. وەردێنە ■ نوردەی نانوایی

**نابوینک / nabûynik/**: ☜ **نابینك**

**نابویی / nabûyî/**: ☜ **نابوتی ـ۱**

**نابە / nabe/**: ☜ **نایاب**

**نابەجا / nabeca/**: ☜ **نابەجێ**

**نابەجێ**[1] **/ nabecê/**: ئاوەڵناو. نابەجا؛ نەگونجاو؛ لە کات و شوێنی نەشیاودا ‹کاکە خوا ئیشی نابەجێ ناکا/ تا کێو نەبینێ بەفری تێ ناکا «بێکەس»› ■ نامعقول؛ نابجا

**نابەجێ**[2]: ئاوەڵکار. نابەجا؛ دوور لە کات و شوێنی شیاودا ‹بەجێ ماوم لە یاران، نابەجێ ماوم، ئەجەل زوو بە!/ بە مردن لەم قسووری ژینە ئیستیعفا نەکەم چ بکەم؟ «مەحوی»› ■ در زمان و مکان نامُناسب

**نابەجێیی / nabecêyî/**: ☜ **نارەوایی**

**نابەحەق / nabeĥeq/**: ☜ **ناحەق**

**نابەدڵ**[1] **/ nabedił/**: ئاوەڵناو. نەوەدڵ؛ دڵ‌نەخواز ‹کاری نابەدڵ› ■ برخلاف میل

**نابەدڵ**[2]: ئاوەڵکار. نەوەدڵ؛ بە شێوەی نەخوازراو ‹نابەدل رۆیشت› ■ با اکراه

**نابەدڵی / nabedişî/**: ناو. بێ‌وازی؛ پێملی؛ بێ‌مەیلی ■ اکراه

**نابەشەر / nabaşar/:** ☜ **نائینسان**

**نابەکار / nabekar/:** ئاوەڵناو. بەدکار؛ خراپکار ☰ نابکار

**نابەکاری / nabekarî/:** ناو. خراپەکاری؛ کارچەوتی ☰ نابکاری

**نابەکام / nabekam/:** ئاوەڵناو. بە مراد نەگەیشتوو ☰ ناکام

**نابەڵەد / nabełed/:** ☜ **ناشارەزا ـ٢**

**نابەڵەڵ / nabełeł/:** ☜ **ناشارەزا ـ٢**

**نابەڵەو / nabełew/:** ☜ **ناشارەزا ـ٢**

**نابەوەخت / nabewext/:** ☜ **ناوەخت**

**نابەین / nabeyn/:** ناو. دوڕ؛ مابەین ☰ میان؛ وسط

**نابینایی / nabînayî/:** ناو. کوێری ☰ نابینایی

**نابینک / nabînik/:** ناو. نابووینک؛ وەردێنە؛ تیرۆکی ئەستووری ئەنگوتک پان کردنەوە ☰ وَردنەی نانوایی

**ناپارازی / naparazî/:** ☜ **ناپارێزی**

**ناپارێزی / naparêzî/:** ناو. ناپارازی؛ دۆخی گوێنەدان؛ کاری خۆ نزیک کردنەوە لە شتێ کە بڤەیە و ئەبێ لێیدوور بی ☰ ناپرهیزی؛ بی‌احتیاطی

**ناپاک / napak/:** ئاوەڵناو. ١. پیس؛ گەمار؛ چلکن ٢. *[پلار]* دوخمان؛ خایەن ☰ ١. کثیف ٢. خائن

**ناپاکی / napakî/:** ناو. خەلێلە؛ خلێلە؛ خلێلە؛ خەیانەت؛ دوخمانی ☰ خیانت

**ناپاڵم / napałm/:** ناو. جۆرێ بۆمبای بەقەوەت ‹ئەم قەلادزەی بە شەهید مەشهوورە/ هەر بە ناپالمی بەعس خاپوورە «هێمن»› ☰ نوعی بمب

**ناپایدار / napaydar/:** ئاوەڵناو. بێ‌مشوار ☰ ناپایدار

**ناپوخت / napuxt/:** ☜ **نەپوخت**

**ناپۆڕ / napoř/:** ئاوەڵناو. نەپۆڕ؛ ناڵەبار؛ ناهەنجار: ١. ناحەز؛ کرێت ‹دەنگی ناپۆڕ؛ چروچاوی ناپۆڕ› ٢. نەگونجاو؛ ناساز لەگەڵ قانوون یان دابی کۆمەڵگا ‹قسەی ناپۆڕ؛ هەڵسوکەوتی ناپۆڕ› ☰ ١. زشت؛ بدریخت ٢. ناهنجار

**ناپۆڕی / napořî/:** ناو. ١. ناحەزی؛ کرێتی ٢. ناهەنجاری؛ نەگونجاوی؛ بارودۆخی نەسازان و نەگونجان لەگەڵ کۆمەڵگا ☰ ١. ناهنجاری ٢. زشتی

**ناپەسن / napesin/:** ☜ **ناپەسند**

**ناپەسند / napesind/:** ئاوەڵناو. ناپەسن؛ ناپەسەن؛ ناپەسەند؛ نەشیاو ☰ ناپسند

**ناپەسەن / napesen/:** ☜ **ناپەسند**

**ناپەسەند / napesend/:** ☜ **ناپەسند**

**ناپەیا / napeya/:** ☜ **ناپەیدا**

**ناپەیدا / napeyda/:** ئاوەڵناو. ناپەیا؛ دەرنەکەوتوو؛ بەدی نەهاتوو ‹موغی بێئاگری شەوی یەلدام/ چاوەڕێی چارەنووسی ناپەیدام «هێمن»› ☰ ناپیدا

**ناپیا / nap(i)ya/:** ☜ **ناپیاو**

**ناپیاگ / nap(i)yag/:** ☜ **ناپیاو**

**ناپیاو / nap(i)yaw/:** ئاوەڵناو. نامرۆڤ؛ نامەرد؛ نەپیاو؛ نەمەرد؛ نەمێر؛ ناپیا؛ ناپیاگ؛ نەمرۆ؛ نەمرۆڤ؛ کۆژۆ؛ لە مەردایەتی بەدوور ☰ نامرد

**ناپیاوەتی / nap(i)yawetî/:** ☜ **ناپیاوی**

**ناپیاوی / nap(i)yawî/:** ناو. ناپیاوەتی؛ نامەردی؛ خوێڕییەتی ☰ نامردی

**نات / nat/:** ئاوەڵکار. لەم لاوە ☰ از این طرف

**ناتا / nata/:** ئاوەڵکار. نات؛ لەیرەوە ☰ از این طرف

**ناتاو[1] / nataw/:** ئاوەڵناو. ١. ناتەواو؛ کەم و کووڕ؛ هێشتا نەپوخت ٢. توند و تیژ و بێ هەدا ‹گەرمایەکی ناتاوە› ☰ ١. ناپخته؛ ناتمام ٢. بی‌امان

**ناتاو[2]:** ئاوەڵکار. بە توندی و پڕی ‹ناتاو وەشاندی؛ ناتاو نەباری› ☰ به شدّت

**ناتاوان / natawan/:** ناو. بێگوناه؛ بێتاوان ☰ بی‌گُناه

**ناتاوی / natawî/:** ناو. ١. کەم و کووڕی؛ بەدوور لە پوختی و دروستی ٢. تیژ و توندی بە بێ

وچان 🇮🇷 ١. نقص؛ كاستی ٢. بی‌امانی

**ناتدۆت / natdot**/: ئاوەڵكار. ئێرە و ئەوێ 🇮🇷 اینجا و آنجا

**ناتر / natir**/: ناو. دەلاک؛ سەرشۆر؛ کیسەکێشی حەمام 🇮🇷 دلاک حمام

**ناترە / natre**/: ناو. بەرناترە؛ شادە؛ شارە؛ نیشانەی نێوان کا و گەنم لە خەرمان 🇮🇷 چوبک‌های فاصل کاه و گندم در خرمن

**ناتریوم / natiryum**/: ☜ سودیوم

**ناترا / natřa**/: ئاوەڵكار. لێرەوە؛ لەم شوێنەوە 🇮🇷 از این طرف

**ناتف / natif**/: ناو. گشتەکی بـرین دروون 🇮🇷 نـخ بخیه

**ناتواتا / natwata**/: ئاوەڵكار. لێرەولەوێ 🇮🇷 اینجا و آنجا

**ناتواو / nat(i)waw**/: ☜ ناتەواو

**ناتۆ / nato**/: ناو. نەرمۆ؛ نانخۆری بێکارە 🇮🇷 طُفیلی

**ناتۆر / nator**/: نـاو. نـاهتۆر: ١. باغـەوان ٢. کێشکچی؛ قەرەوڵ 🇮🇷 ١. باغبان ٢. نگهبان

**ناتۆرە / natore**/: ناو. نەتۆرە؛ کەسـناوی ناپەسـند ‹ناو و ناتۆرە لێک هەڵدان› 🇮🇷 لقب زشت

**ناتەبا / nateba**/: ئاوەڵناو. ناسـاز؛ لـە سـازان و تەبایی دڕدۆنگ ‹هەر چەنـد بـە ڕواڵـە ناتـەبا بـوو/ ڕاستوو دەوێ بۆ مە دۆستی چا بـوو «هـەژار، *مـەم و زین*»› 🇮🇷 ناسازگار

**ناتەبایی / natebayî**/: نـاو. ناحاواوی؛ دۆخی تەیار نـەبوون بـۆ ئاریکـاری، هـاودەمی یـان هـاوژینی دەگەڵ کەسـێکدا ‹ناتـەبایی پارتـە سیاسـییەکانی باشوور› 🇮🇷 ناسازگاری

**ناتەمیز / natemîz**/: ☜ ناتەمیس

**ناتـەمیس / natemîs**/: ئاوەڵـناو. ناتـەمیز؛ پـیس؛ چلکن؛ گەمار 🇮🇷 کثیف

**ناتەنی / natenî**/: ئاوەڵناو. زڕ؛ هەڵی 🇮🇷 ناتنی

**ناتەوان / natewan**/: ئاوەڵـناو. بێ‌تاقەت؛ بێ‌تین‌وتا ‹بابم نەخۆش و ناتەوانە› 🇮🇷 ناتوان

**ناتەواو / natewaw**/: ناو. ناتواو: ١. پەشێو؛ شپرێو ‹شیعرەکانم دوور لە تـۆ نـازی نییـە/ وەک هـەتیوی ناتـــەواو و دەربـــەدەر «نـــاری»› ٢. نیمـــەچڵ؛ پێچەوانەی تەواو ‹هەر کەس کـە تـەواوە، ناتـەواوی ماڵە/ کێ خێوی کولاوکاڵە، بۆ خـۆی کاڵـە «هـەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› 🇮🇷 ١. پریشان‌حال ٢. ناتمام

**ناتەواوی / natewawî**/: نـاو. کەم‌وکووڕی؛ دۆخـی نەبوونی پێویستی ‹ئەزانم ناتەواوی تێـدا هەیـە› 🇮🇷 کم‌وکسری

**ناجایز / nacayz**/: ☜ ناحەق

**ناجسن / nacisn**/: ئاوەڵـناو. ١. بەدفـەڕ؛ ناپەسـند ‹نەزیلەی قسەی نابەجێش وەکوو پنجێکـی ناجسـنە «هـەژار، *قورئـان*»› ٢. خوێـڕی؛ ڕەگـەزچرووک؛ بنیچە خوێڕی ‹ئەو هەتیوە ناجسـنە نـاوکی بـە درۆ براوە› 🇮🇷 ١. بدجنس ٢. نانجیب؛ فرومایه

**ناجۆر[1] / nacor**/: ئاوەڵـناو. نـاجوور: ١. نـەخونجاو؛ نەساز لەگەڵ تەکووزی و ڕێـک‌وپێکیـدا ‹ڕەنگـی ناجۆر› ٢. ناباو؛ بـەدەر لـە ڕێسـا و یاسـا ‹بـەرگی نـاجۆر› ٣. خـراپ؛ گـەن؛ بـە دۆخ و چۆنیـەتی خراپـەوە ‹خواردنـەوەی نـاجۆر؛ کـاری نـاجۆر› ٤. نـاخۆش؛ ناحـەز ‹قسـەی نـاجۆر› 🇮🇷 ١. نـاجور ٢. نامناسب ٣. بد ۴. زشت

**ناجۆر[2]**: ئاوەڵكار. ناجوور؛ بە شێوەیەکی نـەگونجاو ‹ناجۆر قسەی کرد› 🇮🇷 ناجور

**ناجو / nacû**/: ناو. سنۆبەر؛ نەوژ 🇮🇷 درخت صنوبر

**ناجوور / nacûr**/: ☜ ناجۆر

**ناجەستە / naceste**/: ئاوەڵـــناو. ناجەســـە: ١. پووتەکە؛ نابووت ٢. ناکۆک؛ بارگران 🇮🇷 ١. بی‌نمود؛ کوتاه‌قد بدریخت ٢. بیمار؛ مریض‌احوال

**ناجەسە / nacese**/: ☜ ناجەستە

**ناچاخ / naçax**/: ئاوەڵناو. بێ‌کەیف 🇮🇷 بی‌حال؛ نزار

**ناچار**[1] / naçar/: ئاوەڵناو. نەچار؛ بێدەرەتان؛ مەجبوور؛ ناعیلاج؛ ناعلاج؛ نالانج؛ نائلاج؛ گەنگیر ‹سبەینێ ناچارە بڕوا› ■ ناگُزیر

**ناچار**[2]: ئاوەڵکار. نەچار؛ چاریناچار؛ بە ناچاری ‹ناچار لەگەڵ هاوڕێم هەڵساین/ خەو ئەم بەهەشتەی لە کیس داین! «گۆران»› ■ ناگُزیر

**ناچارکراو** / naçark(i)raw/: ئاوەڵناو. زۆرلێکراو ■ مجبور شده

**ناچاری** / naçarî/: ☜ **ناعیلاجی**

**ناچە** / naçe/: ناو. کووژە؛ نادۆڵ؛ گەرووڵەی ئاش ■ گلوی آسیا که گندم از آن ریزد

**ناچەخ** / naçex/: ناو. تەوری دەستی شەڕکەران لە پێشوودا ■ تبر دست جنگاوران قدیم

**ناچیز** / naçîz/: ئاوەڵناو. خۆیڕی؛ ناجسن ■ فرومایە

**ناچیزە**[1] / naçîze/: ناو. ناشیزە: ١. ژنێ کە لە فەرمانی شووی سەرپێچی دەکا ٢. ژنێ کە شووەکەی بەبێ تەلاقدانی بەجێی هێشتووە ■ ١و٢. زن ناشزە

⊡ **ناچیزە کردن**: وێڵ کردنی ژن بەبێ تەلاق دانی ■ ناشزە کردن

**ناچیزە**[2]: ئاوەڵناو. بێقابل؛ هیچنەژیاو ■ بی‌ارزش

**ناحاڵی** / naĥalî/: ئاوەڵناو. لا؛ گوێنەبیس؛ بێ‌گوێچکە؛ پندرحالی ■ خُشک‌سر

**ناحاواو** / naĥawaw/: ☜ **ناحەواوە**

**ناحاواوی** / naĥawawî/: ناو. ناتەبایی ■ ناسازگاری

**ناحەز** / naĥez/: ئاوەڵناو. نەهەز: ١. بێبەش لە جوانی و خوشیکی ‹شەو لە ماڵی هەواڵێکی چۆدارم میوان بووم، خەسوویەکی پیری زۆر ناحەزی هەبوو«هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. دوژمن ‹ئامۆژگارییەکەم فەرامۆش نەکەی/ دوژمن و ناحەز بە خۆت خۆش نەکەی «موفتی پێنجوێنی»› ٣. ناخۆش؛ ناشیرین؛ خراپ ‹خودا پێی خۆش نییە هیچ کەس بە دەنگی بەرز قسەی ناحەز بدرکێنێ «هەژار، *قورئان*»› ■ ١. زشت ٢. دُشمن ٣. بد

**ناحەزی** / naĥezî/: ناو. ١. بێبەشی لە جوانی ٢. دوژمنایەتی ■ ١. زشتی ٢. دُشمنی

**ناحەساو** / naĥesaw/: ئاوەڵناو. ١. گێچەڵ؛ سەرچەوت ‹مامەڵەی لەگەڵ مەکە! ناحەساوە› ٢. نابەجێ؛ نەگونجاو ‹قسەی ناحەساو› ■ ١. بدحساب ٢. نامقبول

**ناحەساوی** / naĥesawî/: ناو. ناحەسێبی؛ ناحەسێوی: ١. سەرچەوتی ٢. قسەی بێجێ ■ ١. بدحسابی ٢. حرف بی‌حساب

**ناحەسێبی** / naĥesêbî/: ☜ **ناحەساوی**

**ناحەسێوی** / naĥesêwî/: ☜ **ناحەساوی**

**ناحەق**[1] / naĥeq/: ئاوەڵناو. نابەحەق؛ نەهەق؛ ناجایز؛ ناهەق؛ پێچەوانەی حەق و ڕەوا ■ ناروا

⊡ **ناحەق بوون**: ١. نابەحەق بوون؛ ناڕەوا بوون ‹قسەکەی یەکجار ناحەق بوو› ٢. بە هەڵەدا چوون ‹دەی ناحەقمە وا بێژم؟؛ خەڵک ناحەقیان نییە تووڕە بن› ■ ١. ناروا بودن ٢. در اشتباه بودن

**ناحەق**[2]: ئاوەڵکار. نابەحەق؛ نەهەق؛ ناجایز؛ ناهەق؛ ناڕەوا؛ بەبێ ئەوەی لە سەر حەق بێ ‹چەندە قین و قار ناحەق ئەنوێنێ/ دڵی چەند هەژار بێ هیچ ئەشکێنێ «قانع»› ■ بە ناحق

**ناحەقی** / naĥeqî/: ناو. ناهەقی؛ نەهەقەی؛ زوڵم ‹ئەو کەسانەی هەرگا کاری خراپ دەکەن، یان ناحەقی لە خۆ دەکەن ... «هەژار، *قورئان*»› ■ ستم

**ناحەقیکار** / naĥeqîkar/: ئاوەڵناو. ناهەقیکار؛ زاڵم ‹لەو بەلایەش خۆپارێزن کە تایبەتی ناحەقیکارانتان نییە ... «هەژار، *قورئان*»› ■ ستمگر

**ناحەواوە** / naĥawawe/: ئاوەڵناو. ناحاواو: ١. بزۆز؛ نائارام ‹بە دەست و پاوە ناوێستێ، هێندە ناحەواوەیە› ٢. ناسازگار؛ لە سازان و تەبایی دڕدۆنگ ‹نەحەواوەیە، لە هیچ کوێ جێی نابێتەوە› ■ ١.

نائارام ٢. ناسازگار

**ناحیە / nahye/**: ناو. مەڵبەند؛ بەشێ لە سەرزەمینی چەند ئاوایی ☰ ناحیه

**ناخ / nax/**: ناو. ١. ناوەڕۆک؛ دەروون و ناوەوەی هەر شتێ ‹... ئاو ڕۆچوو بە ناخی ئاخا و کار سەری گرت، لە سەر جوودی لەنگەری گرت ... «هەژار، *قورئان*»› ٢. جێگە؛ شوێن ٣. ئۆقیانووس؛ دەریای گەورە ☰ ١. ناف؛ عُمق ٢. جای ٣. اقیانوس

▣ **لە ناخی دڵەوە:** لە کانگای دڵەوە؛ لە قووڵایی دڵ و دەروونەوە؛ بە تەواوی هەست و خۆشەویستییەوە ☰ از ته دل

**ناخار / naxar/**: ئاوەڵناو. ١. زبر و بەکەند و کڵۆ ٢. *[مەجاز]* بەدفەڕ؛ شەڕهەڵایسێن ٣. ناغار؛ زۆر تیژ (تیخ) ☰ ١. ناتراشیده؛ ناهموار ٢. ناسازگار؛ شرور ٣. بسیار بُرّا (تیغ)

**ناخاس / naxas/**: ناو. ناسزا؛ نافات؛ قسەی ناشیرین ‹تا کەی وە ئەفسووس بسام دەس وە دەس؟/ تا کەی بشنەوم ناخاس لە ناکەس؟ «شامی»› ☰ حرف زشت

**ناخاڵ / naxafił/**: ☜ **ناخلاف**

**ناخاڵە / naxałe/**: ئاوەڵناو. نەزان؛ تێنەگەیشتوو ☰ نادان

**ناخاوێنی / naxawênî/**: ناو. چەپەڵی؛ پیسی ☰ کثافت

**ناخر / naxir/**: ناو. ١. ڕەوەی شەو بە کێو ٢. گاگەل؛ گاڕان ٣. گاوان؛ شوانی گاگەل ☰ ١. رمەای که شب در صحرا می‌ماند ٢. گلەی گاو ٣. گاوچران

**ناخرقەوان / naxirqewan/**: ناو. دەڕۆژەی ئاخری سەرماوەز کە ڕەوە دەکرێتە ژوورەوە ☰ ده روزه آخر آذر ماه

**ناخرە / nax(i)ře/**: ناو. گەروو؛ گەرووی؛ گەڵوو ☰ گلو

**ناخلاف / nax(i)łaf/**: ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. ناخافڵ؛ نەخافڵ؛ بێئاگاداری؛ لەپڕ؛ کتوپڕ ☰ ناگهان

**ناخن / naxin/**: ☜ **نینۆک**

**ناخوا / nax(i)wa/**: ☜ **ناخودا**

**ناخودا / naxuda/**: ناو. ناخوا: ١. گەمیەوان ٢. گوناحبار و لە خوا نەترس ‹لەم بەحری فیتنە بەلکی نەجاتت بدا خودا/ داوێنی باخودا بگرە، بەردە ناخودا «مەحوی»› ☰ ١. ناخُدا ٢. از خدا بی‌خبر

**ناخوری / naxurî/**: ناو. ١. ☜ **نوخووری** ٢. نۆبەرەی میوە ☰ ١. ☜ **نوخوری** ٢. نوبر میوه

**ناخوڕە / naxuře/**: ناو. پلووسک؛ پلوور ☰ ناودان

**ناخون / naxun/**: ☜ **نینۆک**

**ناخوندە / naxunde/**: ☜ **نەخوێندەوار**

**ناخونشەیتان / naxunşeytan/**: ناو. شەیتانۆکە ☰ حلزون

**ناخونگر / naxungir/**: ☜ **نینۆکبڕ**

**ناخونوشک / naxunwişk/**: ئاوەڵناو. ڕژد؛ چکووس ☰ خسیس

**ناخونە / naxune/**: ناو. ١. ☜ **ناخونەک ـ٢** ٢. پرزەی دەوری تەون کە پۆی تێوە نادرێ ☰ ١. ☜ **ناخونەک ـ٢** ٢. حاشیەی فرش و گلیم

**ناخونەک / naxunek/**: ناو. ١. نوقورچک؛ کاری هەڵگرتن و ڕفاندنی هەندێکی کەم لە شتێ، بەتایبەت خواردەمەنی ٢. ناخونە؛ ناخووینە؛ لەکەی باریک و سوور کە لە سەر سپیلکەی چاو پەیدا دەبێ و بەرەو ڕەشایی چاو دەکشێ ☰ ١و٢. ناخُنک

**ناخونەکرێ / naxunek(i)řê/**: ناو. کاری نینۆک لێک کراندن، کە زۆرتر بۆ دنەدان بۆ شەڕ دەکرێ ‹ناخونەکرێ، جەنگ هەڵخرێ «مەسەل»› ☰ عمل ناخن بر هم ساییدن، به قصد ساز شُدن دعوا

**ناخویا / naxuya/**: ئاوەڵناو. بەرپیوار؛ لە بەر چاو گوم ☰ گُم؛ ناپیدا

**ناخویایی** / naxuyayî/: ☜ **نادیاری**

**ناخوێن** / nax(i)wên/: ☜ **نینۆك**

**ناخوێنگیر** / nax(i)wêngîr/: ☜ **نینۆكبڕ**

**ناخۆ** / naxo/: سارستە. ١. هەتا وا بێ ٢. کە وایە ٣. ئەیچۆن ☰ ١. تا چنین است ٢. کە اینطور ٣. البته

**ناخۆرا** / naxora/: ئاوەڵناو. کەمخۆر ☰ کم‌خوراک

**ناخۆرە** / naxore/: ناو. زەمینی قوپاو؛ عەرزی ڕۆچوو ☰ زمین فرورفته

**ناخۆش** / naxoş/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **نەخۆش** ٢. چێژە ناپەسند ‹ئاوی ناخۆش› ٣. تووش ‹قسەی ناخۆش› ٤. ناتەبا (پێوەندی) ‹بەینمان ناخۆشە› ☰ ١. ☜ **نەخۆش** ٢. بدطعم ٣. بد ۴. تیره (رابطه)

**ناخۆشی** / naxoşî/: ناو. ١. سەردەمی تەڕ و تووشی کەش ٢. ☜ **نەخۆشی** ٣. ناتەبایی ‹تێپەڕێ هێندە بە ناخۆشی ئەگەر ژینی درێژ/ خۆزگە سەدخۆزگە بەوانەی کەم و ئاسوودە دەژین «هێمن»› ☰ ١. موسم سرما و بارش ٢. ☜ **نەخۆشی** ٣. ناسازگاری

**ناخۆشین** / naxoşîn/: ☜ **نەخۆشی**

**ناخوو** / naxû/: ☜ **نینۆك**

**ناخوون** / naxûn/: ☜ **نینۆك**

**ناخوونشەیتان** / naxûnşeytan/: ناو. شەیتانۆکە؛ هێلکەشەیتان ☰ حلزون

**ناخوونگیر** / naxûngîr/: ☜ **نینۆكبڕ**

**ناخوونەزێ** / naxûnezê/: ناو. کەڵەموو؛ دووپشک ☰ کژدمه؛ عقربک

**ناخووین** / naxûyn/: ☜ **نینۆك**

**ناخووینە** / naxûyne/: ☜ **ناخونەك ـ٢**

**ناخەڵگی** / naxelgî/: ناو. نەفامی ☰ نادانی

**ناخەڵەف** / naxeɫef/: ئاوەڵناو. کولێرەحەرام؛ خاوەن ئاکار و جوولانەوەی دژ بە شێوەی دایک و باب ☰ ناخلف

**ناخێر**[1] / naxêr/: ئاوەڵناو. هیچوپووچ و بێبەهرە ‹ئەم باخە ناخێرەم بۆ چییە، بەر ناگرێ؟!› ☰ بی‌بهره و هرزه

**ناخێر**[2]: ئاوەڵکار. نە؛ نا؛ پێچەوانەی ئارێ ☰ نه؛ نه خیر

**نادان**[1] / nadan/: ناو. پەژیوانی ☰ پشیمانی

**نادان**[2]: ئاوەڵناو. ١. ڕژد؛ دەسقووچاو؛ چرووک ٢. نەزان؛ تێنەگەیشتوو. هەروەها: **نادانی** ☰ ١. خسیس ٢. نادان

**نادایە** / nadaye/: ناو. زڕدایک؛ باوەژن ☰ نامادری

**نادر** / nadir/: ئاوەڵناو. کەمتا؛ کەموێنە ☰ کم‌نظیر؛ نادر

**نادروس** / nad(i)rûs/: ☜ **نادروست**

**نادروست** / nad(i)rust/: ئاوەڵناو. نادرووس؛ نادروس: ١. خراپ؛ نائەهل؛ چەوت و خوار ‹پیاوی نادروست› ٢. نابەجێ ‹قسەی نادروست› ☰ ١. نادُرُست ٢. ناشایست

**نادرووس** / nad(i)rûs/: ☜ **نادروست**

**نادۆک** / nadok/: ناو. داری سێپای مەشکە ☰ چوب سه‌پایه‌ی مشک

**نادۆڵ** / nadoɫ/: ناو. کووزە؛ ناچە؛ گەڕوولەی ئاش ☰ گلوی آسیاب

**نادە** / nade/: ئاوەڵناو. ١. زوو پێگەییو ٢. زوو پێکهاتوو ☰ ١. زودرس ٢. زودانجام

**نادەیەنە** / nadeyne/: چاوگ. ڕوانین؛ نوارین؛ تواشا کردن ☰ نگاه کردن

**نادی** / nadî/: ناو. یانە؛ یانی؛ گازتین؛ گاستین؛ جێگەی تایبەت بۆ ئەنجامدانی کارێ ☰ باشگاه

**نادیار** / nad(i)yar/: ئاوەڵناو. بەرپیوار؛ ناخویا ☰ ناپیدا؛ گُم

**نادیاری** / nad(i)yarî/: ناو. بەرپیواری؛ ناخویایی ‹دیدەی بەد دەردش نادیاری بۆ/ جە کۆ مەوینۆت تا لێت کاری بۆ؟ «مەولەوی»› ☰ ناپیدایی؛ نامعلومی

**نار** / nar/: ☜ **هەنار**

**نارا** / nara/: ئاوەڵکار. ١. ئێستە؛ ئێستێ؛ ئایسە ٢. هەر ئەم جارە ☰ ١. اکنون ٢. فقط این بار

**ناراڤ** / narav/: ئاوەڵناو. تۆکمە؛ ناوپڕ و پتەو ☰ مُحکم و توپر

**ناراو**[1] / naraw/: ناو. نارای: ١. ژەهراو ٢. بەلا و نەخۆشی و بەدبەختی ‹ناراوی دەروون› ☰ ١. زهرابه ٢. بلا و مُصیبت

▣ **ناراو هاتن**: ناراو هەڵهێنان؛ گیانەسەر کردن ‹شووەکەی زۆر تووشە، ناراوی هاتووە بە دەستیەوە› ☰ به جان آمدن

**ناراو هەڵهێنان**: ☜ **ناراو هاتن**

**ناراو**[2]: ☜ **ناردراو**

**نارای** / naray/: ☜ **ناراو**[1]

**ناربە** / narbe/: ناو. ڕەوتی پشکووتنی گەڵا و لکی ڕووەک ☰ فرایند شُکفتن و جوانه زدن گیاه

**ناربەند** / narbend/: ناو. دارەبی ئێختەکراو ☰ درخت بید اخته شده

**نارجیل** / narcîl/: ناو. جۆرێ دەنکە تەزبیحە ☰ نوعی دانەی تسبیح

**نارداني** / nardanî/: ☜ **نەردیوان**

**ناردران** / nard(i)ran/: چاوگ. نێردران؛ هەناریان ☰ فرستاده شدن

**ناردراو** / nard(i)raw/: ئاوەڵناو. ناراو؛ ناریاگ؛ هەناریاگ؛ ڕەوانەکراو ☰ فرستاده شده

**ناردن** / nardin/: چاوگ. تێپەڕ. //ناردت؛ دەنێری؛ بنێرە// ١. هەناردن؛ ڕەوانە کردن ‹ڕەحمێ بکە زوو بە شاهی سەردم/ بینێرە خودا، دەوایی دەردم «ئاوات»› ٢. ڕاسپاردن ‹ئەی خودا چ بکەم؟ ئەجەل لەم لاوە قەسدی جانییە/ دلبەریش ناردوویەتی: جان ماڵمە، نەیدا بە کەس! «حاجی قادر»› ☰ ١. فرستادن ٢. سفارش کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەناردن

**ناردنەوە** / nard(i)newe/: چاوگ. هەناردنەوە ☰ بارفرستادن

**نارده** / narde/: ناو. هەنارده؛ هەناردی ☰ صادرات

**ناردین** / nardîn/: ناو. جەگەن؛ گیاحەسیر ☰ گیاه حصیربافی

**ناردیوان** / nardîwan/: ☜ **نەردیوان**

**نارک** / narik/: ناو. ١. ڕوومەت؛ دەموچاو ٢. گۆنا؛ کوڵم ☰ ١. صورت ٢. گونه

**نارگیله** / nargîle/: ناو. قلیانئاوی ☰ قلیان

**نارنج** / narinc/: ناو. نارینج: ١. دارێکی مزراتی بە گوڵی پێنجبەشی و پەرچەمی کورتەوە ٢. بەری ئەو دارە کە میوەیەکی گەورە، خڕ، ئاودار و ترشە، بە ڕەنگی زەردی مەیلەو سوور (نارنجی) ☰ ١و٢. نارنج

**نارنجۆک** / narincok/: ناو. نارنجەک؛ قومبولە؛ قونبولە؛ قۆمبەلە؛ قومبەرە؛ ڕوممانە؛ ڕومانە؛ هەنارۆک؛ کەرستەیەکی بچووکی تەقینەوە پڕ لە تەقەمەنی کە بە دەست یان ئامێر دەیهاوێن ☰ نارنجک

**نارنجەک** / narincek/: ☜ **نارنجۆک**

**نارنجی**[1] / narincî/: ناو. نارووجە؛ هەر ڕەنگێکی نێوان سوور و زەرد ☰ رنگ نارنجی

**نارنجی**[2]: ئاوەڵناو. بەڕەنگی نارنج؛ نارنجی ڕەنگ ☰ نارنجی رنگ

**نارنگی** / naringî/: ناو. لالەنگی: ١. دارێکی مزراتی بە گەڵای باریک و درێژەوە ٢. بەری خڕ و مێوەی ئەو دارە کە خۆراکێکی بۆنخۆشی نەرم و شیرین یان ترشە ☰ ١و٢. نارنگی

**نارون** / narwen/: ☜ **نارەوەند**

**نارەوەند** / narwend/: ناو. نارەوەن؛ نارەوەند؛ نارەوەن؛ دارەڕەش؛ وزم؛ وەزم؛ دارێکی بێبەر بە قەدی ڕەش، لکوپۆپی هەڵچوو، چێوی ڕەق و پتەو، گەڵای دادانە ـ دادانەی چڕ و گوڵی نێر و

مێیەوە 🇮🇷 نارون

**ناڕۆک / narok/**: ناو. جـۆرێ هـەناری پچـووک و بەلەک 🇮🇷 نوعی انار کوچک و نامرغوب

**ناروجه / narûce/**: ☜ **نارنجی**[1]

**ناره / nare/**: ناو. نرکە؛ نەعرەتە؛ گوڕەی بە دەنگی بەرز 🇮🇷 غُرّش

**نارەتە / narete/**: ناو. نـارە؛ نەعرەتـە؛ هـەرای بـە دەنگی بەرز 🇮🇷 نعره

**نارەنار / narenar/**: دەنگەناو. لۆرەلۆر؛ گـۆرانی لـە سـەر خـۆ و لـە بـەر خـۆوە ‹نـە نارەنـاری کـیـژی مەشـکەژێنە/ نـە سیرەسـیری شمقـاڕ و شـەهێنە «هێمن»› 🇮🇷 ترنُم

**نارەوەن / narewen/**: ☜ **نارەوەند**

**نارەوەند / narewend/**: ☜ **نارەوەند**

**نارياگ / naryag/**: ☜ **ناردراو**

**نارین[1] / narîn/**: چاوگ. نالین؛ نالاندن 🇮🇷 نالیدن

**نارین[2]**: ناو. گۆرانی خەمبارانە 🇮🇷 آهنگ حزین

**نارین[3]**: ئاوەڵناو. ١. شـەرمن (بـۆ ژن) ٢. ناسـک؛ تەنک 🇮🇷 ١. خجالتی ٢. نازُک

**نارینج / narînc/**: ☜ **نارنج**

**ناریعەلی / narî'elî/**: ناو. *[کنایە]* زۆر بـە دژواری ‹بە هەزار ناریعەلی دوو دینارم لە ڕەئیس ساندەوە، کە نەوەک دیسان بۆ بلێت دامێنم! «هەژار، چێشـتی مجێور»› 🇮🇷 زحمت زیاد

**نارێ / narê/**: ناو. قامێکە 🇮🇷 ترانەایست

**ناڕازی / nařazî/**: ☜ **ناڕەزا**

**ناڕاس / nařas/**: ☜ **ناڕاست**

**ناڕاست[1] / nařast/**: ناو. ناڕاس؛ درۆ؛ دوور لە ڕاستی ‹وا تێکەڵ بووە ڕاستی بە ناڕاست/ لێک هەڵناوێرێین، وەک دۆشاو و ماست «ویسالی»› 🇮🇷 دروغ

**ناڕاست[2]**: ئاوەڵناو. ناڕاس: ١. لار؛ خوار؛ پێچەوانەی ڕاست ‹دیوارەکەی ناڕاسـتە› ٢. درۆزن ‹تـەنیا لـە کەسانی پـیس و ناڕاسـت/ نێـوانی دەگـرت و خـۆی دەپارست «هەژار، *مەم و زین*»› ٣. ناڕێک؛ دوور لـە هێلی ڕاست ‹ڕێگای ناڕاست ناتباتـە مـەنزل› 🇮🇷 ١. کج ٢. دروغگو ٣. غیرمستقیم

**ناڕاستی / nařastî/**: نـاو. ناڕاسـی: ١. نادروسـتی ‹ناڕاستی قسـەکەی دەرکـەوت› ٢. لار و خـواری؛ چەفتی ‹ناڕاستی دیوارەکەیە، دەرگاکەی لار کردووە› ٣. درۆزنی ‹خوا لامان با لە ناڕاستی› ٤. ناڕێکی 🇮🇷 ١. نادرستی ٢. کجی ٣. دروغگویی ۴. ناراستی

**ناڕاسی / nařasî/**: ☜ **ناڕاستی**

**ناڕام / nařam/**: ئاوەڵـناو. تۆسـن؛ سـەرکێش 🇮🇷 توسن

**ناڕۆژ / nařoj/**: ناو. ئەمڕۆ؛ ئیمڕۆ 🇮🇷 امروز

**ناڕۆشنی / nařoş(i)nî/**: نـاو. نـاڕوونی؛ لێڵـی. هەروەها: **ناڕۆشن** 🇮🇷 کِدری؛ تاری

**ناڕوون / nařûn/**: ئاوەڵناو. لێڵ؛ ناڕۆشن. هـەروەها: **ناڕوونی** 🇮🇷 کِدر

**ناڕەحەت / nařeĥet/**: ئاوەڵـناو. ١. بـێ‌بـەش لـە ئاسوودەیی ‹شوێنەکەتان ناڕەحەت نییە؟› ٢. جاڕز؛ عاجز؛ بێ‌کەیف ‹لەوانەدا ئـی واش هەیـە پێغەمبـەر ناڕەحەت دەکەن «هەژار، *قورئان*»› ٣. ڕق‌هەسـتاو؛ هەڵچوو؛ تووڕە ‹لەو قسەیە زۆر لێی ناڕەحەت بووم› ٤. زۆر نەخۆش ‹نەخۆشێکی ناڕەحەتە› ٥. پەشێو؛ دڵخورت؛ دڵەودوا ‹ناڕەحەتـی تۆم، چیت بـە سـەرا دێ؟!› 🇮🇷 ١. ناراحت ٢. پکر ٣. خشـمگین ۴. بسـیار بیمار ۵. نگران

**ناڕەحەتی / nařeĥetî/**: نـاو. ١. عـاجزی؛ جـاڕزی ‹ناڕەحەتی ناوێ، هیچ من و هیچ تـۆ› ٢. قەلسـی؛ تووڕەیی ٣. نەخۆشی 🇮🇷 ١. پکری ٢. عصـبانیت ٣. کسالت

▣ **ناڕەحەتی کردن**: ١. دڵتەنگی کـردن؛ دەردەدڵ کـردن ٢. ناڕەزایـەتی دەربـڕین 🇮🇷 ١. درددل کردن ٢. اظهار نارضایتی کردن

**ناڕەزا / nařeza/**: ئاوەڵناو. ناڕازی؛ زویر؛ زوێر؛ زیـز؛

لووتخوار ‹نارەزای جەلای یاران بەریای ویم/ جە زەخمی یاران نە سەر و پای ویم «بێسارانی»› ■ ناخُشنود

**نارەزایەتی / nařezayetî/**: ناو. نارەزایی؛ چۆنیەتی بەرهەڵست بوون؛ بەرتەک دانەوە ‹نارەزایەتی و خۆپیشاندانی هاووڵاتیان› ■ اعتراض

**نارەزایی / nařezayî/**: ناو. ١. زویری؛ زوێری؛ زووری؛ زیزی؛ نارەزایی؛ ناقایلی ٢. ☜ **نارەزایەتی** ■ ١. ناخُشنودی ٢. ☜ **نارەزایەتی**

**نارەسەن / nařesen/**: ئاوەڵناو. ناجسن: ١. نانەجیب؛ دژهێم ‹دراوسێی نارەسەن بەلایە› ٢. زڕ؛ زڕە ‹بازاڕ پڕ بووە لە کاڵای ساختە و نارەسەن› ■ ١. بدگوهر ٢. بدل؛ نااصل

**نارەوا / nařewa/**: ئاوەڵناو. نەڕەوا: ١. ناحەق؛ نابەجێ ‹کرا کاری نارەوا/ لە دار درا پێشەوا «هێمن»› ٢. قەڵب ■ ١. ناروا ٢. تقلبی

**نارەوان / nařewan/**: ئاوەڵناو. ١. باش لە بەر نەکراو ٢. تایبەتمەندی خوێندنەوەی بە گرێ و گۆڵ ٣. تور؛ لاڵەپەتە؛ تایبەتمەندی زمانێ کە لە قسە کردندا گت دەکا و ڕەت دەبا ■ ١. ازبرنشده ٢. ویژگی روخوانی با اشکال ٣. الکن

**نارەوایی / nařewayî/**: ناو. نابەجێیی ■ ناروایی

**نارێک / nařêk/**: ئاوەڵناو. ١. ناجۆر؛ نەخونجاو ‹کاری نارێک و نالەبار› ٢. ناورتە؛ شپرێو؛ شپرزە؛ قەوچل؛ گلەنجوو؛ تێکەڵ ـ پێکەڵ ‹ددانی نارێک› ٣. لێژ؛ دژی تەخت و ساف ‹ڕێگای نارێک› ٤. ناکۆک؛ ناتەبا ‹پێکەوە نارێکن› ■ ١. ناجور ٢. نامُرتب ٣. ناهموار ۴. ناساز

**ناز[1] / naz/**: ناو. ١. مینگە و فینگە؛ ئانوئوون؛ ئاینوئۆین؛ مەهن؛ قەژمەری؛ خۆگری و ئاوڕ نەدانەوەی درۆینە ‹دەورێ دەر وە ناز وە پیالەوە/ ژەنگی دڵ وە جام مەی بماڵەوە «مەولەوی»› ٢. خۆشەویستی؛ دلۆڤانی ‹من ئەر نازم هەن وەر نازم نییەن/ جە خاک پای دۆست پەروازم نییەن «بێسارانی»› ٣. ☜ **نەوز** ٤. ئاسوودەیی؛ تەناهی ‹ئێستا ئەوا هەرچی بڵێی نیعمەت و نازە/ هەمووی ئەدا بە یەک دڵۆپ فرمێسکی تازە «گۆران»› ٥. فەخر؛ شانازی؛ هەستی هەڤیازی ‹ناز پێوە کردن› ٦. نەوازش؛ کاری لاواندنەوە و حاواندنەوە ‹کێ نازی بکێشێ لە غەریبیدا؟› ٧. نەوازش؛ کاری پەلاندن و بە ئەسپایی دەست پێدا هێنان ‹لە باوەشی دەگرت و نازی دەکێشا› ■ ١. ناز ٢. محبت؛ مهربانی ٣. ☜ **نەوز** ۴. آسایش ۵. تفاخُر ۶و۷. نوازش

⊡ **ناز پێ دان**: حاواندنەوە؛ نەوازش کردن ■ ناز و نوازش کردن

**ناز پێوە کردن**: شانازی پێکردن ■ بالیدن

**ناز فرۆشتن**: ناز کردن؛ عیشوە و قەمزە کردن ■ ناز کردن

**ناز کردن**: ☜ **ناز فرۆشتن**

**ناز کرین**: هەڵگرتن و قبووڵ کردنی ناز و عیشوە ■ ناز خریدن؛ ناز کشیدن

**نازی کەسێک کێشان**: دڵنەوایی‌کردن لە کەسێک؛ خەمخۆر و دڵسۆزی کەسێک بوون؛ ئاکار و کرداری بە ناز و نیمنازی کەسێ هەڵگرتن ■ ناز کسی را خریدن

**ناز[2]**: ئاوەڵناو. زۆر جوان؛ قەشەنگ ‹ئەو سەروی نازە تەوسەنی هێنایە تاز و تەک/ هەستا قیامەت و فەلەک ئەستوونییە گەرەک «مەحوی»› ■ نازنین

**نازار / nazar/**: ☜ **نازدار**

**نازاری / nazarî/**: ☜ **نازداری**

**نازاڤ / nazav/**: ☜ **نازاو-١**

**نازاو / nazaw/**: ئاوەڵناو. ١. نازاڤ؛ تێراو؛ تورت و شەق ٢. لە بەر زۆر ئاوادان زەردبوو ■ ١. شاداب ٢. زرد شده بر اثر زیاد آب دادن

**نازای / nazay/**: چاوگ. نازین؛ شانازی کردن ■

نازیدن

**نازبالْشت / nazbałişt/:** ☜ **نازبالْنج**

**نازبالْنج / nazbałinc/:** ناو. نازبالْشت؛ گۆشەگیرە؛ گۆشگیرە؛ بالْەشتە؛ بالْنجەک؛ ژێرمرکی؛ بالْنجی سووک و بچووک ≤ نازبالش

**نازپەروەر / nazperwer/:** ☜ **نازپەروەردە**

**نازپـەروەردە / nazperwerde/:** نـاو. نازپـەروەر؛ نازدار؛ نەچاشیاگ؛ بە ناز بەخێوکراو؛ بارهـاتوو لـە ئاسوودەحالْی و ئاسایشـدا، وێـڕای چـاوەدێری و میرەوانی، بێ‌چەرمەسەری دیتن ≤ نازپروردە

**نـازدار / nazdar/:** ئاوەلْـناو. نـازار؛ نـازەنین؛ خۆشەویسـت ‹ئەگـەر دەرچـێ لەسـەر ئـەم دینـە ڕۆحت/ دەچێتە قالبێکی شۆخ و نازدار «شـێخ ڕەزا»› ≤ نازنین؛ محبوب

**نازداری / nazdarî/:** نـاو. نازاری؛ خۆشەویسـتی ≤ محبوبیّت

**نازرنگ / naziring/:** ئاوەلْناو. زەین‌کوێر؛ بێ‌هـۆش ≤ کودن

**نازرینگ / naz(i)rîng/:** ئاوەلْناو. گێل؛ کەم‌ئاوەز ≤ کودن

**نازفرۆش / nazf(i)roş/:** ئاوەلْناو. *[کینایە]* بـەعینوان؛ عەیار؛ نازکەر ≤ طنّاز

**نازک / nazik/:** ☜ **ناسك**

**نازکـکـار / nazikkar/:** نـاو. ١. دارتاشـی کـاری وردەکاری ٢. بەنایێ کـە گولـبڕی بـە گـەچ لـە خانوان دەکا ≤ ١. نازک‌کار چوب ٢. گچبُر

**نازکـکـاری / nazikkarî/:** نـاو. ناسـک‌کـاری: ١. کاری دروست کردنی ئامرازی جۆراوجـۆر (وەک: تەختەنـەرد، قەلْـەمدان، مێـز شـەترەنج و...) بـە جوانکاری لە سـەر چێـو، بەتایبـەت دارگـوێز ٢. نەرمەکاری؛ قۆناغـێ لـە ڕەوتی مـال کردنـەوەدا، بریتی لە سپی‌کاری، کاشـی‌کـاری، هەلْواسـینی دەرگـا و دەلاقـە و... ٣. *[مەجاز]* وردەکـاری؛ نەستەق‌بێژی ≤ ١تا٣. نازک‌کاری

**نازکەر / nazker/:** ئاوەلْناو. نازفرۆش ≤ عشوەگر

**نازکەش / nazkeş/:** ☜ **نازکێش**

**نازکـەک / nazkek/:** ئاوەلْـناو. هنـف؛ ناسـکەنام؛ لەش‌نازک ≤ نازک‌اندام

**نازکەی / nazkey/:** ☜ **ناسکی**

**نازکی / nazikî/:** ☜ **ناسکی**

**نـازکێش[1] / nazkêş/:** نـاو. *[مەجاز]* نازکـەش؛ سەرپەرشت یان کەسـێ کـە نـازی یـەکێکی تـر دەکێشێ (زۆرتر دایک) ‹یاخوا نازکێشت نەمرێ› ≤ نازکش

**نـازکێش[2]:** ئاوەلْـناو. نازکـەش ‹دایکـی نـازکێش› ≤ نازکش

**نازگ / nazig/:** ☜ **ناسك**

**نازلی[1] / nazlî/:** ناو. قامێکە ≤ ترانەایست

**نازلی[2]:** ئاوەلْناو. نازدار؛ نازار ≤ نازنین

**نازم / nazim/:** ناو. ئەوی چـاوەدێری و ڕاگـرتنی ڕێک‌وپێکی شوێنێکی لە ئەستۆدایە ≤ ناظم

**نازناز / naznaz/:** نـاو. گولێکە بـە زۆر ڕەنگـان ≤ گل نازناز

**نازنـازی / naznazî/:** ئاوەلْـناو. نازپـێ‌دراو؛ بەنازفێرکراو ≤ نازنازی

**نازناو / naznaw/:** نـاو. نـاوێ کـە زۆرتـر شـاعیر بۆخۆی هەلْیدەبژێرێ و لە شیعرەکانیدا بەو نـاوە خـۆی دەناسـێنێ ‹سـەید موحەممـەد ئـەمینی شێخولئیسلام، نازناو هێمن› ≤ تخلُص

**نازونوز / naz û nûz/:** ناو. نازونیمنـاز؛ نازونیونـاز؛ ناز بە مینگە و فینگە ≤ ناز و عشوە

**نازونوزکـەر / naz û nûzker/:** ئاوەلْـناو. *[پـلار]* تیتالباز؛ هایلۆ؛ بەئاین‌وئۆین ≤ اطواری

**نازونیاز / naz û n(i)yaz/:** نـاو. کاری ناز کـردن و دلْدانەوە ≤ عمل ناز کردن و دلداری دادن

**نازونیمناز / naz û nîmnaz/:** ☜ **نازونوز**

**نازونیوناز** / naz û nîwnaz/: ☜ **نازونوز**

**نازه** / naze/: ناو. گۆشتی بن ناخوون ☰ گوشت زیر ناخن

▣ **نازەی ناخوون**: ☜ **نازەناخوون**

**نازەریف** / nazerîf/: ئاوەڵناو. ١. ناپەسند ٢. ناحەز؛ ناشیرین ☰ ١. ناپسند ٢. بدگل

**نازەناخوون** / nazenaxûn/: ناو. نازەی ناخوون؛ بننینۆک ☰ بخشی از ناخن که زیر پوست قرار دارد

**نازەنگوشت** / nazenguşt/: ناو. ئەنگوستیلە ☰ انگشتانه

**نازەنین** / nazenîn/: ئاوەڵناو. بەناز؛ نازدار ☰ نازنین

**نازیرەک** / nazîrek/: ئاوەڵناو. گێل؛ نازرینگ ☰ کودَن

**نازین** / nazîn/: چاوگ. تێنەپەر. //نازیت ؛ دەنازی؛ بنازە// ١. شانازی کردن ‹کوردستان بە کۆبانی دەنازێ کە ڕۆڵەی وا ئازای لێ کەوتۆتەوە› ٢. فیس کردن؛ خۆ هەڵکێشان ‹بە داراییەکەی دەنازێ› ٣. هەست بە پشتگەرمی کردن و لەو سۆنگەوە کۆ نەکردن لە کەس ☰ ١. مُباهات کردن ٢. فخر فروختن ٣. نازیدن (بار منفی)

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: نازیو/ چاوگی نەرێنی: نەنازین

**نازێ** / nazê/: ئاوەڵناو. نازەنین ☰ نازنین

**ناژ** / naj/: ☜ **نەوژ**

**ناژتن** / najtin/: ☜ **ناشتن**

**ناژران** / najran/: ☜ **نێژران**

**ناژو** / najiw/: ☜ **نەوژ**

**ناژۆ** / najo/: ☜ **نەوژ**

**ناژوو** / najû/: ☜ **نەوژ**

**ناژین** / najîn/: ☜ **نەوژ**

**ناس**[1] / nas/: ناو. ١. ئاشنا؛ پێچەوانەی بیانی ٢. جۆرێ تووتنی تێکەڵ بە قسڵ و زەرنیخە، دەیمژن ☰ ١. شناس ٢. ناس؛ نوعی توتون مکیدنی مخلوط با آهک و زرنیخ

▣ **ناس کرن**: ١. ناسین؛ بە دیتن شارەزا بوون لە چلۆنەتی کەسێ یا شوێنێ ‹عشقێ کربوون وەسا موبەددەل/ وان یێک و دوو ناس نەکر ژ ئەووەل «خانی»› ٢. ناسینەوە ☰ ١. شناختن ٢. بازشناختن

▪ **ناس**[2]: پاشەوشە. ئاشنا و ئاگادار لە کەسێ یا شتێ ‹ڕێناس؛ خواناس› ☰ ـ شناس

**ناساخ** / nasax/: ☜ **ناساغ**

**ناساخی** / nasaxî/: ☜ **ناساغی**

**ناساز** / nasaz/: ئاوەڵناو. ١. نەخۆش؛ نەخوەش؛ نەوەش؛ ناساخ؛ بەدحاڵ؛ لە لەش بیمار ٢. کەمدەست؛ ناتەواو ٣. نارێک؛ ناجۆر؛ نەگونجاو ☰ ١. بیمار ٢. کم‌درآمد ٣. ناساز

**نازسازگار** / nasazgar/: ئاوەڵناو. ناکۆک؛ ناتەبا؛ ناحاواو؛ دژوەر؛ نەساز؛ تایبەتمەندی ئەوەی کە لە سازان و تەبایی دڕدۆنگە ☰ ناسازگار

**ناسازی** / nasazî/: ناو. هللە؛ نەخۆشین ☰ بیماری

**ناساغ** / nasağ/: ناو/ ئاوەڵناو. ناساخ؛ ناساق؛ نەخۆش ☰ بیمار

**ناساغی** / nasağî/: ناو. ناساخی؛ ناساقی؛ نەخۆشی ☰ بیماری

**ناساف** / nasaf/: ئاوەڵناو. پڕچین؛ غەور؛ زۆر چیندار ☰ پُرچین و شکن

**ناسافی** / nasafî/: ناو. لێڵی؛ نارۆشنی؛ ناسافییەتی ☰ کدری

**ناسافییەتی** / nasafîyetî/: ☜ **ناسافی**

**ناساق** / nasaq/: ☜ **ناساغ**

**ناساقی** / nasaqî/: ☜ **ناساغی**

**ناسان** / nasan/: چاوگ. لێ شارەزا بوون؛ بە حاڵ و باڵ زانین ☰ شناختن

**ناساندن** / nasandin/: چاوگ. تێپەر. //ناساندت؛ دەناسێنی؛ بناسێنە// پێناسین؛ شارەزایی دان بە دیتران لەمەڕ چۆنیەتی کەسێ یان شتێکەوە

‹خۆت بناسێنە› ⊑ مُعرفی کردن؛ شناساندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەناساندن

**ناسپاس** / nasipas/: ئاوەڵناو. سپڵە؛ سفلە؛ پێنەزان؛ دەلـۆش؛ ناشکور؛ ناشگیر؛ سفرەدڕ؛ قەیرمەزان؛ نمەککوێر؛ نمەکنەناس ⊑ ناسپاس

**ناسپاسی** / nas(i)pasî/: ناو. سپڵەیی؛ پێنەزانی ⊑ ناسپاسی

**ناسران** / nasran/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //ناسرای؛ دەناسرێی؛ بناسرێ// شناسران؛ ناسریان؛ شناس بوون ⊑ شناخته شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ناسراو/ چاوگی نەرێنی: نەناسران

**ناسراو** / nasraw/: ئاوەڵناو. ناسیاگ؛ ناسیاو: ١. ناس؛ ئاشنا ‹ئەم پیاوە ناسراوتانە؟› ٢. بەناوبانگ؛ خاوەن دەنگ و ناو ‹کەسایەتییەکی ناسراوە› ٣. پێزانراو ‹ناسراو و نەناسراو هەموو ملکی وین› ⊑ ١. آشنا ٢. مشهور ٣. شناختەشدە

**ناسراوی** / nasrawî/: ناو. بانگ؛ ناوبانگ؛ شۆرەت ⊑ آوازە

**ناسرگە** / nasirge/: ناو. عەرەبانە؛ فرغوون ⊑ فرغون

**ناسروشتی** / nas(i)ruştî/: ئاوەڵناو. دەسکرد ‹بە شێوەیەکی ناسروشتی بەرهەم دێت› ⊑ غیرطبیعی

**ناسزا**[1] / nasiza/: ناو. جوێن؛ جنێو؛ سخێف ‹ناسزا گوتن› ⊑ دُشنام

**ناسزا**[2]: ئاوەڵناو. پێچەوانەی شیاو؛ نالایق ‹قسەی ناسزا› ⊑ ناشایست

**ناسک** / nasik/: ئاوەڵناو. نازک؛ نازگ؛ ناسکە: ١. نارین؛ تەنک؛ تنک؛ تەننگ؛ فڕ؛ تیوون؛ واڵ؛ بە مەودای کەم لە نێوان بەر و پشتدا ‹کاغەزی ناسک› ٢. *[گفتاری]* باریک؛ زراف؛ کەمئەستوور؛ واوەژیلک؛ بە ئەستوورایی هندک ‹ئەنگوستی ناسک› ٣. *[مەجاز]* نەرم و نیان ‹دەنگی ناسک› ٤. *[مەجاز]* لەبەردڵان، ورد و ژیرانە ‹شیعری ناسک› ⊑ ١و٢. نازُک ٣. نرم ۴. لطیف؛ ظریف

**ناسکخەیاڵ** / nasikxeyał/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* خاوەن بیر و ئەندیشەی ورد و جوان ⊑ نازُکخیال

**ناسکری** / nask(i)rî/: ئاوەڵناو. ناسراو؛ ناسیاگ؛ ئاشنا ⊑ آشنا

**ناسککاری** / nasikkarî/: ☜ **نازککاری**

**ناسکنارنجی** / nasiknarincî/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* تەسکۆڵە؛ تەسکۆڵانە؛ نازنازی؛ بەبێ خۆڕاگری و بەرگەی پێویست لە بەرانبەر سەختی و دژوارییەوە ⊑ نازُکنارنجی

**ناسکۆڵ** / naskoł/: ئاوەڵناو. تەسکۆڵ؛ تەسکۆڵانە؛ باریکەلە ⊑ باریک اندام

**ناسکۆڵە** / naskołe/: ئاوەڵناو. ناسکی بچکۆڵە ⊑ نازُک مامانی

**ناسکە**[1] / naske/: ناو. باریکایەک لە شت ⊑ نوار باریک از چیزی

**ناسکە**[2]: ئاوەڵناو. ناسک؛ تەنک ‹کولێرە ناسکە› ⊑ نازُک

**ناسکە**[3]: دەنگەناو. قرووسکەی تاژی ⊑ نالەی سگ شکاری

**ناسکە**[4]: سارستە. ١. ئای کە چەند باشە ‹ناسکە هەوای کوردستان› ٢. خۆزگەم بە ‹ناسکە بارودۆخی وا› ⊑ ١و٢. خوشا

**ناسکەرمێ** / naskermê/: ☜ **ناسکەهەرمێ**

**ناسکەناسک** / naskenask/: دەنگەناو. ناڵە و قرووسکەی تاژی ⊑ نالە و زوزەی سگ شکاری

**ناسکەنام** / naskenam/: ئاوەڵناو. لەشناسک ⊑ نازکاندام

**ناسکەنان** / naskenan/: ناو. کولێرەناسکە ⊑ نان شیرمال

**ناسکەهەرمێ** / naskehermê/: ناو. ناسکەرمێ؛ جۆرێ هەرمێ ⊑ نوعی گلابی

**ناسکهەست / nasikhest/:** ئاوەڵناو. هەستۆک؛ هەستیار. هەروەها: **ناسکهەستی** ☰ پُراحساس

**ناسکی / nas(i)kî/:** ناو. نازکەی؛ نازکی: ١. نەرمی ٢. تورتی ٣. باریکی؛ زراڤی ☰ ١. نرمی ٢. تُردی ٣. نازُکی

**ناسنامە / nasname/:** ناو. پێناس؛ پێناسە؛ سەرنامە؛ شناسنامە؛ بەڵگەی فەرمی ناسینەوەی هەر کەس، بە شێوەی دەفتەرچە یان لاپەڕەیەکی دەوڵەتی، کە ناو، ناوی بنەماڵەیی (یان باب و باپیر) و ئاگاداریتری ئەو کەسەی تێدا نووسراوە ☰ شناسنامه

**ناسنەکری / nasnek(i)rî/:** ئاوەڵناو. کەسنەناس؛ نائاشنا؛ بێگانە ☰ ناشناس

**ناسۆر / nasor/:** ناو. ١. برینی تەشەنا کردوو ‹ژانی ناسۆری جوداییم چێشتووە/ هەرچی خۆشمویستووە، جێمهێشتووە «هێمن»› ٢. فیستۆل؛ دۆخی گەیشتنەوە یەکی ناسروشتی دوو هلۆلی ناوەکی لەش یان دەم کردنەوەی شوێنێکی وا لە لەشدا ☰ ١. زخم دیرالتیام ٢. فیستول

**ناسوت / nasût/:** ناو.[ئەدەبی] دونیا؛ جیهانی ماددی ☰ ناسوت

**ناسوس / nasûs/:** ناو. ترومپا؛ دینەمۆ ☰ تُلمبه

**ناسە / nase/:** ☜ **شناسە**

**ناسەرەکی / naserekî/:** ئاوەڵناو. فەرعی؛ لاوەکی ☰ فرعی

**- ناسی / nasî-/:** پاشەوشە. ـ شناسی؛ ناسینی شتێک یان زانستی سەر بەو شتە ‹ژینناسی؛ مێژووناسی› ☰ ـ شناسی

**ناسیار / nasyar/:** ناو. ئاشنا؛ شناس؛ ناس ☰ آشنا

**ناسیاری / nasyarî/:** ناو. ١. ئاشنایی؛ ئاشنایەتی ٢. کار و ڕەوتی ناسین و داوەری کردن ٣. زانیاری؛ بەرهەمی ناسین ‹خەڵک بە وردبینی و ناسیاری لە هەڵبژاردندا بەشداری بکەن› ☰ ١. آشنایی ٢و٣. شناخت

**ناسیاگ / nasyag/:** ☜ **ناسراو**

**ناسیاو / nasyaw/:** ☜ **ناسراو**

**ناسیاوی / nasyawî/:** ناو. ئاشنایەتی؛ ئاشنایی؛ قوونەبان ☰ آشنایی

**ناسین / nasîn/:** چاوگ. تێپەڕ. //ناسیت؛ دەناسی؛ بناسە// ناس کرن: ١. وێنا کردن؛ شباندن؛ وە بیر هاتنەوە یان لێکجیاکردنەوەی کەسێ یان شتێک بە پێی ئاگاداری پێشوو ‹پاش بیست ساڵ، تا چاوم پێ کەوت، ناسیم› ٢. لە چۆنیەتی و دەروونی کەسێ یان شتێک ئاگا بوون ‹چاکت ئەناسم› ٣. لەمەڕ کەسێ داوەری یان باوەڕێکی تایبەت هەبوون ‹هەموان ئەویان بە پیاوەتی و دەستودڵبازی دەناسی› ٤. ئاشنا بوون لەگەڵ کەس یان شتێکدا ‹هەموو کەسوکاری دەناسێ› ☰ ١تا٤. شناختن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ناسیو/ چاوگی نەرێنی: نەناسین

**ناسینەوە / nasînewe/:** چاوگ. تێپەڕ. //ناسیتەوە؛ دەناسیەوە؛ بناسەوە// ناس کرن: ١. ناسینی چۆنیەتی شتێک یان پێناسەی کەسێک ‹شارەکە زۆر گۆڕاوە، ئێستا ببینی نایناسییەوە› ٢. وێنا کردن؛ شباندن؛ وە بیر هێنانەوەی کەس یان شتێک کە پێشتر دەتناسی ‹ئەی ئەوانەی قەت لە بیرم ناچنەوە!/ ئێستە بمبینن ئەرێ دەمناسنەوە؟ «هێمن»› ☰ ١. شناسایی کردن ٢. بازشناختن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەناسینەوە

**ناسێنەر / nasêner/:** ☜ **نوێنەر[١]ـ٣**

**ناشاد / naşad/:** ئاوەڵناو. خەفەتبار؛ غەمگین ☰ اندوهگین

**ناشارەزا / naşareza/:** ئاوەڵناو. نەشارەزا؛ نەشەهرەزا؛ ناشی: ١. لێنەزان ٢. نابەڵەد؛ نابەڵەڵ؛ نابەڵەو ‹لە دوورەوە ناوت بیستووم/

ناشارەزا خۆشت ویستووم «پەشێو» ☰ ١. ناشی ٢. ناوارد

**ناشایس / naşayis/:** ☜ **ناشایست**

**ناشایست / naşayist/:** ئاوەڵناو. ناشایس؛ ناشایستە؛ نەشیاو؛ ناسزا ☰ ناشایستە

**ناشایستە / naşayiste/:** ☜ **ناشایست**

**ناشت / naşt/:** ئاوەڵکار. بەرەو ئەیرە؛ بەم لاوە؛ بۆ ئێرە ☰ به این طرف

**ناشتا[1] / naşta/:** ناو. ناشتایی؛ بەرچایی؛ تاشت ☰ صُبحانه

▣ **ناشتا کردن:** تاشت خارن؛ بەرچایی کردن ☰ صُبحانه خوردن

**ناشتا[2]:** ئاوەڵناو. خوورێن؛ خرێن؛ خورێنی؛ دڵخالی؛ هێشتا هیچنەخواردوو پاش لە خەو هەستان ☰ ناشتا

**ناشتایاشتا / naştayaşta/:** ☜ **ناشتوناشت**

**ناشتایی / naştayî/:** ناو. ناشتا؛ بەرچایی؛ تاشت ☰ صُبحانه

**ناشتداشت / naştdaşt/:** ☜ **ناشتوناشت**

**ناشتداشتا / naştdaşta/:** ☜ **ناشتوناشت**

**ناشتن / naştin/:** چاوگ. تێپەر. //ناشتت؛ دەنێژی؛ بنێژە// ناژتن؛ نان؛ نیان: ١. چاندن؛ وەشاردنی شتی وەک بنی نەمام و ... لە توێی خاک (چاڵێک) و داپۆشانی بە مەبەستی داهاتی کشتوکاڵ یان باخەوانی ٢. مردوو تەمراندن ☰ ١. کاشتن ٢. به خاک سپردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ناشتوو/ چاوگی نەرێنی: نەناشتن

**ناشتوناشت / naşt û 'aşt/:** ئاوەڵکار. ناشتایاشتا؛ ناشتداشت؛ ناشتداشتا؛ لێر و لەوێ ☰ اینجا و آنجا

**ناشتو / naştû/:** ئاوەڵناو. ناشتی؛ نێژراو؛ بنگڵخراو ☰ دفن‌شده؛ مدفون

**ناشتی / naştî/:** ☜ **ناشتو**

**ناشرین / naş(i)rîn/:** ☜ **ناشیرین**

**ناشکور / naşikur/:** ☜ **ناشوکر**

**ناشکیر / naşikîr/:** ☜ **ناشوکر**

**ناشگیر / naşgîr/:** ☜ **ناشوکر**

**ناشوکر / naşuk(i)r/:** ئاوەڵناو. ناشکیر؛ ناشکور؛ ناشگیر؛ سپڵە؛ پێنەزان ☰ ناسپاس

**ناشوکری / naşukrî/:** ناو. سپڵەیی؛ پێنەزانی ‹نەبێتە ناشوکری، ئەمە ژیان نییە، ژانە!› ☰ نمک نشناسی؛ ناسپاسی

**ناشۆ / naşo/:** ئاوەڵناو. محاڵ؛ تایبەتمەندی شتێ کە نەبووە و نابێ ☰ ناممکن

**ناشۆر / naşor/:** ئاوەڵناو. بەرگ و کەلوپەلێ کە بە خاوێنی ڕادەگیرێ بۆ ڕۆژی لازم ☰ لباس پاکیزه برای مواقع لزوم

**ناشەر / naşer/:** ناو. نارەوا ☰ ناروا

**ناشی / naşî/:** ئاوەڵناو. ١. ☜ **ناشارەزا** ٢. تازەکار ☰ ١. ☜ **ناشارەزا** ٢. مُبتدی

**ناشیرن / naşîrin/:** ☜ **ناشیرین**

**ناشیرنی / naşîrinî/:** ☜ **ناشیرینی**

**ناشیرین / naşîrîn/:** ئاوەڵناو. ناشرین؛ ناشیرن؛ نەشیرین: ١. ناحەز؛ بێبەش لە جوانی ٢. بە ئاکار و قسەی خراپەوە ٣. ناپەسن ‹ئاکاری ناشیرین› ☰ ١. زشت؛ بدگل ٢. زشتخو ٣. ناپسند

**ناشیرینی / naşîrînî/:** ناو. ناشیرنی؛ ناشیرینیەتی؛ ناحەزی؛ بێبەشی لە جوانی ☰ زشتی

**ناشیرینیەتی / naşîrînyetî/:** ☜ **ناشیرینی**

**ناشیزە / naşîze/:** ☜ **ناچیزە[1]**

**ناشێ / naşê/:** ئاوەڵکار. باڵێ؛ لەوە ناچێ ☰ بعید است

**ناعار / na'ar/:** ئاوەڵناو. بێعار؛ پنتی؛ گەڤەندە؛ بەبێ هەستی تەریقەو بوون ☰ بی‌عار

**ناعال / na'al/:** ئاوەڵناو. بێبایەخ؛ بێقەدر ☰

بی‌ارزش

**ناعس** / na's/: ناوەڵناو. ١. تەمەڵ؛ تەوەزەل ٢. بێکارە و بێ‌کەڵک ☰ ١. تنبل ٢. بیکاره

**ناعلاج** / na'(i)lac/: ☜ **ناچار**[1]

**ناعنا** / na'na/: ☜ **نەعنا**

**ناعنە** / na'ne/: ☜ **نەعنا**

**ناعوایش** / na'wayîş/: چاوگ. میاوـمیاو کردنی پشیلە ☰ میوـمیو کردن گُربه

**ناعور** / na'ûr/: ☜ **ناعورە**

**ناعورە** / na'ûre/: ناو. ناعوور؛ چەرخێ کە دە ناو بیردا و بە چوارپێ ئاوی پێ دەخەنە دەر ☰ چرخِ چاه که با حیوان بالا می‌کشند

**ناعەسڵ** / na'es(i)ł/: ناوەڵناو. ناحەسڵ؛ نارەسەن؛ ناجسن ☰ بدلی

**ناعیلاج**[1] / na'îlac/: ناوەڵناو. ناچار؛ مەجبوور ‹پیاوی هەژار ناعیلاجە زۆر شت قبووڵ بکا›☰ ناچار

**ناعیلاج**[2]: ناوەڵکار. چاری‌ناچار؛ لەناچاری، بەمەجبووری ‹ناعیلاج بە دەستی لەرزۆکەوە، بە داروو‌کەیەکەوە کە بە دەستمەوە بوو، خۆم بە سەر جندۆکەی مەلعوون دادا! «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ ناچار

**ناعیلاجی**[1] / na'îlacî/: ناو. ناچاری؛ مەجبووری ‹دەس، لە دەریادا، دەبا بۆ پووشێ ئینسانی غەریب/ ناعیلاجی مەرد ئەکا ئەڵبەت بە نامەرد ئەی ڕەفیق! «حەمدی»› ☰ ناچاری

**ناعیلاجی**[2]: ناوەڵناو. ناچاری؛ مەجبووری؛ زۆرەکی ‹بە زەهری ناعیلاجیتە لە ناکەس ویستنی لوقمە/ بە مردنتە کە گوێی ناشی ئەخنکێنێ خرۆشی نەی «گۆران»› ☰ اجباری

**ناغار** / nağar/: ☜ **ناخارـ٣**

**ناف** / naf/: ناو. وەگ؛ چاخ؛ هەرەت؛ جەنگە ☰ موسم

**نافات** / nafat/: ☜ **ناخاس**

**نافام** / nafam/: ☜ **نەفام**

**نافامی** / nafamî/: ☜ **نەفامی**

**نافک** / nafik/: ناو. ١. ☜ **نێوک ـ١** ٢. کاکڵ؛ ناوکە بادام و گوێز و ... ☰ ١. ☜ **نێوک ـ١** ٢. مغز بادام و گردو و...

**نافەرمان** / naferman/: ناوەڵناو. سەرشەق؛ سەربزێو ☰ نافرمان

**نافەرمانی** / nafermanî/: ناو. سەربزێوی ☰ سرکشی

**نافەساڵ** / nafesał/: ناوەڵناو. ناحەز؛ ناشیرین ‹سەد شاعیر هەر یەک چەند شەو خۆی جیرەبابە داوە، قەسیدەی پڕ لە درۆی گەورەی بە قەد و بالای نافەسالی خەلیفە یان پادشادا هەڵگوتووە «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ بدریخت

**نافەک** / nafek/: ناو. نیفەک؛ نێفۆک؛ نێفەک؛ نومبەچۆ: ١. پارچەی سێ‌سووچی ناوەڕاستی دەرپێ ٢. پزوو؛ پزگ؛ جێ هۆجەنەی دەرپێ ☰ ١. خشتک شلوار ٢. نیفه؛ جای بند تُنبان

⊡ **نافەک برین**: *[کنایه]* بێ‌حورمەتی کردن؛ ئەتک کرن ☰ توهین کردن

**ناڤ** / nav/: ناو. ١. ☜ **نێوـ١** ٢. دوڕ؛ دەرونی هەر شتێ ‹تیرەک ژ قەوسێ مال زراف/ تێ دل قەوی تاڤێژە ناڤ «مەلای جزیری»› ٣. ☜ **نێوکـ١** ☰ ١. ☜ **نێوـ١** ٢. وسط ٣. ☜ **نێوک ـ١**

⊡ **ناڤ نانین**: درکاندنی ناوی شتێ ☰ نام چیزی را آشکار کردن

**ناڤ برن**: باس کردن ☰ نام بُردن

**ناڤ تێدان**: ناڤ دان؛ دنەدان ☰ تشجیع کردن

**ناڤ چون**: ڕەوان بوون؛ تووشیاری بەلەفیرە بوون ☰ اسهال بودن

**ناڤ دان**: ☜ **ناڤ تێدان**

**ناڤ دانین**: ناڤ لێ‌کرن؛ ناو بۆ کەسێ یان شتێ دیتنەوە و پەسند کردن ☰ نام نهادن

**ناڤ كرن:** ناو دەركردن؛ ناودار بوون ☰ مشهور شدن

**ناڤ لخۆدان:** خۆ هەڵكێشان ☰ لاف زدن

**ناڤ لێ كرن:** ☜ **ناڤ دانین**

**ناڤئێش** / nav'êş/: ناو. زگئێشە ☰ شکم‌درد

**ناڤاندن** / navandin/: چاوگ. ناو لێ نان ☰ نامیدن؛ نام بر چیزی یا کسی گذاشتن

**ناڤبار** / navbar/: ناو. ١. تریان؛ قەرتاڵەی میوە ٢. سەربار؛ باری زیادی ☰ ١. سبد میوه ٢. اضافه بار

**ناڤبارك** / navbarik/: ناو. ١. ناڤباری پچووک؛ قەرتاڵۆکە ٢. نێوباری کەم؛ سەرباری هندک ☰ ١. سبد کوچک ٢. اضافه بار کم

**ناڤبرو** / navb(i)rû/: ناو. ١. تویل؛ ناوچاوان ٢. بەینی دوو برۆ ☰ ١. پیشانی ٢. میان دو ابرو

**ناڤبری** / navb(i)rî/: ☜ **ناوبراو**

**ناڤبریك** / navb(i)rîk/: ناو. چیل؛ پەرژین ☰ پرچین

**ناڤبڕ** / navbiř/: ☜ **ناوبڕ**

**ناڤبڕك** / navbiřk/: ناو. بەرزەک؛ بەرزایی نێوان دوو شت ☰ میانه

**ناڤبژی** / navb(i)jî/: ناو. ناوبژی؛ ناوجی؛ کاری کەوتنە بەینی دوو دژەوە بۆ ئاشت کردنەوە و پێکهێنانیان ☰ میانجیگری

**ناڤبژیكەر** / navb(i)jîker/: ☜ **ناوبژی ـ٢**

**ناڤبۆری** / navborî/: ☜ **ناوبراو**

**ناڤبەر** / navber/: ناو. ١. ناڤبەین؛ نێوان؛ مابەین ‹گوندێ مە ل ناڤبەرا دوو چیایانە› ٢. سەرپشک؛ خاوەن هەڤیازی ☰ ١. مابین ٢. صاحب امتیاز

**ناڤبەركار** / navberkar/: ☜ **ناوبژی**

**ناڤبەند** / navbend/: ناو. ناوەڕاست؛ ناوەند ☰ وسط

**ناڤبەین** / navbeyn/: ☜ **ناڤبەر ـ١**

**ناڤبێژ** / navbêj/: ناو. ١. وەکیل؛ پارێزەر لە دادگا ٢. تکاکار ٣. دەلالی شتفرۆش ☰ ١. وکیل مدافع ٢. شفیع ٣. سمسار

**ناڤتەنگ** / navteng/: ناو. تەنگە؛ کەمەربەندی زین و کورتان ☰ تنگ ستور

**ناڤجەژنان** / navcejnan/: ناو. ناوجەژنان؛ مانگی نێوان شەشەکان و قوربان ☰ ذی‌القعده

**ناڤچاڤ** / navçav/: ☜ **نێوچاوان**

**ناڤچاڤترش** / navçavtirş/: ☜ **نێوچاوان‌گرژ**

**ناڤچال** / navçal/: ناوەڵناو. کوور؛ کۆد؛ کاس؛ باهوو؛ قووپاو؛ داقوپاو؛ هەڵگەڕاو وەک ناوی کاسە ☰ مُقعر

**ناڤچە** / navçe/: ☜ **ناوچە ـ١**

**ناڤچەق** / navçeq/: ناو. ١. ناوەڕاست؛ دوڕ؛ ناوەند ٢. /*شووڕەیی*/ ناوگەڵ ☰ ١. نقطه‌ی وسط ٢. بین دو ران

**ناڤچەنگ** / navçeng/: ناو. بنهەنگڵ؛ بنەنگڵ؛ کەوش ☰ زیربغل

**ناڤچی** / navçî/: ☜ **ناوبژی**

**ناڤچیت** / navçît/: ناو. ١. ☜ **ناوبژی** ٢. دەلالی شت فرۆش ☰ ١. ☜ **ناوبژی** ٢. سمسار

**ناڤخۆ** / navxo/: ناوەڵناو. خۆمانە؛ خۆمانی؛ بەرانبەر بە بێگانە ☰ خودمانی

**ناڤدار** / navdar/: ناوەڵناو. ١. ☜ **نێودار** ٢. پڕ؛ تژی؛ پێچەوانەی بەتاڵ ☰ ١. ☜ **نێودار** ٢. پُر

**ناڤدایەك** / navdayek/: ناوەڵناو. ١. ژێراو؛ بناو ٢. دەمشڕ؛ جوێنفرۆش ☰ ١. غوطه‌ور ٢. بددهن

**ناڤدایی** / navdayî/: ☜ **ناڤدێر**[1]

**ناڤدۆ** / navdo/: ناو. نادۆک؛ دارمەشکە ☰ چوب سەپایه‌ی مشک

**ناڤدەر** / navder/: ناو. بەردەرانە؛ تەکیەی دەرگا ☰ ضلع پایین چهارچوب در

**ناڤدەرگ** / navderg/: ناو. مۆغەرە؛ بڕبڕەی پشت ☰ ستون فقرات

**ناڤدەست / navdest/**: ناو. لەپ؛ بەری دەست ☰ کف دست

**ناڤدەشت / navdeşt/**: ☚ ناودەشت

**ناڤدەنگ / navdeng/**: ☚ ناوبانگ

**ناڤدێر[1] / navdêr/**: ناو. ناڤدایی؛ نامزات؛ نامزەد؛ ناودێر؛ بەربژار؛ ناڤلێکری؛ ناڤکری؛ هەمشێر؛ ئەمشێر؛ کەسێ کە بۆ ئەنجامدانی کارێک دەستی لە سەر نراوە یان بۆ خۆی هاتۆتە پێشەوە «ناڤدێری نوێنەرایەتی» ☰ نامزد؛ کاندیدا

**ناڤدێر[2]**: ئاوەڵناو. ١. ناڤ/ ناو بۆ داندراو؛ ناو لە سەر نراو ٢. ☚ **نێودار** ☰ ١. نامنهاده شده ٢. ☚ **نێودار**

**ناڤران / navran/**: ناو. ناڤرە؛ ناوگەڵ؛ شەقی نێوان دوو لینگ ☰ میان رانها

**ناڤرۆ / navro/**: ☚ **ناڤرۆژ**

**ناڤرۆجە / navroce/**: ☚ **ناڤرۆژ**

**ناڤرۆژ / navroj/**: ناو. ناڤرۆ؛ ناڤرۆجە؛ نیوەڕۆ ☰ نیمروز

**ناڤرۆنک / navronik/**: ☚ **ناڤروو**

**ناڤروو / navrû/**: ناو. ناڤرۆنک؛ جزیرەی نێوان ڕووبار ☰ جزیره‌ی واقع در رودخانه

**ناڤرە / navre/**: ناو. ١. جزیرە؛ ئاد؛ دوڕگە ٢. ☚ **ناڤران** ☰ ١. جزیره ٢. ☚ **ناڤران**

**ناڤزک / navzik/**: ناو. ١. چەشگە؛ هەناو ٢. سی و جەرگ و دڵ ☰ ١. احشاء ٢. دل و جگر و ریه

**ناڤسال / navsal/**: ئاوەڵناو. کالە؛ کامڵ؛ نە پیر نە جوان ☰ میانسال

**ناڤساڵ / navsał/**: ئاوەڵناو. تازە پیر؛ نێوانساڵ ☰ میانسال

**ناڤسەر / navser/**: ناو. ترۆپک؛ دوند؛ بەرزترین شوێن (لە کێو یان دار) ☰ بلندترین نقطه (در کوه یا درخت)

**ناڤسەرک / navserik/**: ناو. ١. کلاوزێڕ ٢. تاج؛ تانج ☰ ١. زرّین کُلاه ٢. تاج

**ناڤشان / navşan/**: ☚ **ناوشان**

**ناڤقۆڵنج / navqołinc/**: ☚ **ناوشان**

**ناڤقەد / navqed/**: ☚ **ناوقەد**

**ناڤک / navik/**: ناو. ١. ☚ **نێوک ـ١** ٢. کاکڵ؛ ناوکی بادام و گوێز و ... ☰ ١. ☚ **نێوک ـ١** ٢. مغز بادام و گردو و...

**ناڤکری / navk(i)rî/**: ☚ **ناڤدێر[1]**

**ناڤکەل / navkel/**: ناو. گەڵ؛ دوڕ هەردوو ڕان ☰ میان هر دو ران

**ناڤگوتراو / navgutraw/**: ☚ **ناوبراو**

**ناڤگە / navge/**: ناو. ڕەزاو؛ ڕێژاو؛ شوێنێ کە دوو چەم دەگەنەوە یەک ☰ محل بە هم پیوستن دو رودخانه

**ناڤگین / navgîn/**: ☚ **ناوەڕاست**

**ناڤلێکری / navlêk(i)rî/**: ☚ **ناڤدێر[1]**

**ناڤماڵ / navmal/**: ناو. مردەماڵ؛ کەلپەلی ماڵ ☰ اثاثیه

**ناڤماڵی / navmalî/**: ناو. کارەکەر؛ کلفەت؛ چێری؛ خدامە؛ قەرەواش ☰ کُلفَت؛ خدمتکار زن

**ناڤنج / navinc/**: ناو. مامناوەند؛ نێڤی؛ ناونجی ☰ میانه

**ناڤنۆ[1] / navno/**: ناو. ١. خزمی دوور ٢. کاری بە درۆ، خۆ هەژار و نەدار شاندان ☰ ١. فامیل دور ٢. خود را به فقیری زدن

**ناڤنۆ[2]**: ئاوەڵناو. ناوزڕاو؛ بەدناو ☰ بدنام

⊡ **ناڤنۆ بوون**: بەدناو بوون؛ ناو زڕان ☰ بدنام شدن

**ناڤنۆ کرن**: بەدناو کردن ☰ بدنام کردن

**ناڤنەتەوەیی / navneteweyî/**: ☚ **نێونەتەوەیی**

**ناڤنەژادی / navnejadî/**: ☚ **نێونەتەوەیی**

**ناڤودەنگ / nav û deng/**: ☚ **ناوبانگ**

**ناڤۆ / navo/**: ئاوەڵناو. تازە؛ نوێ؛ نۆ ☰ تازە

**ناڤەر[1] / naver/**: ناو. دالان ☰ راهرو

**نافەر**[٢]: ئاوەڵکار. ئێرە؛ ئەیرە؛ جێگـای ئامـاژە پـێ کراو ☰ اینجا

**نافەر**[٣]: جێناو. ئێرە؛ ئەیرە؛ لەم شوێنە ☰ اینجا

**نافەرۆک / naverok/**: ☜ **ناوەرۆک**

**نافەند / navend/**: ☜ **ناوەند**

**نافی / navî/**: ناو. دوڕ؛ مەیان ☰ میان

**نافین / navîn/**: ☜ **ناوین**[٢]

**ناق / naq/**: ناو. گەروو؛ قوڕگ ☰ گلو

▣ **ناق گرتن:** دەس نیانـە نـاق؛ قـوڕگ گـرتن ☰ خرخره را گرفتن

**ناق هاتنە یەک:** قوڕگ گیران ☰ گلو گرفتن

**ناقابل / naqabil/**: ☜ **ناقابیل**

**ناقابیـل / naqabîl/**: ئاوەڵـناو. ناقابـیـل: ١. *[پـلار]* کارلەدەست نەهاتوو ٢. بێبایەخ؛ کەمقـەدر ☰ ١. بیکاره ٢. بی‌ارزش

**ناقایل / naqayil/**: ئاوەڵناو. ناڕازی ☰ ناخشنود

**ناقایلی / naqayilî/**: ☜ **ناڕەزایی ـ١**

**نـاقر / naqir/**: نـاو. ناقـڕ؛ ناقـڕە: ١. گـەردن؛ دەرەوەی گەروو ٢. کاری نیوەچڵ ☰ ١. گردن ٢. کار ناتمام

**ناقڕ / naqiř/**: ☜ **ناقر**

**ناقڕە / naq(i)ře/**: ☜ **ناقر**

**نـاقڕێ / naqřê/**: نـاو. ناخـڕە؛ گـەروو؛ گـەرووی؛ گەڵوو ☰ گلو

**ناقورچ / naqurç/**: ☜ **نوقورچك**

**ناقوڵچ / naqułç/**: ☜ **نوقورچك**

**ناقۆ / naqo/**: نـاو. نەقـە؛ بـاقۆ؛ جـۆرێ ماسـی ☰ نوعی ماهی

**نـاقۆڵا / naqoła/**: ئاوەڵناو. ١. ناڕێک؛ چـەفت؛ لار؛ خوار و خێچ ‹دیواری ناقۆڵا› ٢. *[کینایە]* قسـەزان و قسـەخۆش ☰ ١. نـاهموار؛ ناهنجـار ٢. سـخندان و شیرین‌کلام

**ناقە / naqe/**: ☜ **نقە**[١]

**ناقەک / naqek/**: ئاوەڵناو. وشک؛ ویشک؛ ئیشـک؛ هشک ☰ خُشک

**نـاقی / naqî/**: ئاوەڵـناو. دژلـەوەڕ؛ دژخـۆراک ☰ بدخوراک (حیوان)

**ناک**[١] **/ nak/**: ☜ **نێوك ـ١**

**ناک**[٢]: ئاوەڵناو. فەقیر؛ بێچارە ☰ بینوا

**ـ ناک**[٣]: پاشگر. خاوەن ‹نەمناک؛ سامناک› ☰ ـ ناک

**ناکا**[١] **/ naka/**: ئاوەڵکار. نووکـە؛ هەنووکـە ☰ هـم اکنون

**ناکا**[٢]: ئامراز. ١. تۆ بێژی؛ تـۆ بڵـێی ‹ناکـا بارانێـک بباریٚ!› ٢. لەوانەیە؛ بەم نزیکانە ‹تۆ بڕۆ ناکا منیش هاتم› ☰ ١. دور نیست ٢. به زودی

**ناکـار / nakar/**: ئاوەڵناو. لە کـار کـەوتوو ☰ از کـار افتاده

▣ **ناکار کردن:** لە کار خستن ‹لێی دا ناکاری کرد!› ☰ ناکار کردن

**ناکارا / nakara/**: ئاوەڵناو. لامۆ؛ بێتـام؛ ئـاوەکی ☰ آبکی

**ناکام / nakam/**: ئاوەڵناو. بێمراد ☰ ناکام

**ناکـامگیر / nakamgîr/**: ئاوەڵـناو. غافڵـگیر؛ بێئاگاداری؛ تووشی بارودۆخی پێش‌بـینی‌نـەکراو ☰ غافلگیر

**ناکامی / nakamî/**: ☜ **نامرادی**

**ناکـاو / nakaw/**: ئاوەڵـکار. نکـاو؛ نـوکم؛ نـەکاو؛ کـتوپـڕ؛ کـوتوپـڕ؛ ناگـەهان؛ گزوگومبـەت ☰ ناگهان

**نـاکردنی / nakird(i)nî/**: ئاوەڵـناو. خەیاڵـی؛ دەستنەداو ☰ نشدنی

**ناکشت / nakişt/**: ئاوەڵکار. ئەم لایە ☰ این طرف

**ناکڵۆک / nak(i)łok/**: ☜ **نەکڵۆك**

**ناکڵۆکار / nak(i)łokar/**: ئاوەڵناو. ناکولۆکار؛ ناقۆڵا؛ زبر و خوار و خێچ ☰ ناهنجار

**ناکولۆکار / nakułokar/**: ☜ **ناکڵۆکار**

**ناکۆ / nako/**: ئاوەڵکار. دەنا؛ ئەگەرنە 🇮🇷 وگرنە

**ناکۆک / nakok/**: ئاوەڵناو. ١. بێ‌کەیف ‹ئیمڕۆ ناکۆکم› ٢. ناسازگار ‹حیزبەکان لەگەڵ یەکدا ناکۆکن› 🇮🇷 ١. پریشان‌احوال ٢. ناسازگار

**ناکۆکی / nakokî/**: ناو. ١. بێ‌کەیفی ٢. مابەین ناخۆشی ‹ناکۆکی کەوتە نێوانیان› 🇮🇷 ١. بدحالی ٢. کدورت

**ناکەس / nakes/**: ئاوەڵناو. نەکەس؛ ناجسن؛ خوێڕی ‹گەورەنوجاخان دەرچوون بە عەبەس/ کەس بوونە ناکەس ، ناکەس بوونە کەس «فولکلۆر»› 🇮🇷 ناکس

**ناکەسبەچە / nakesbeçe/**: ئاوەڵناو. بنمیتانە؛ نانەجیب 🇮🇷 بداصل؛ نانجیب

**ناکەسی / nakesî/**: ناو. ناپیاوی 🇮🇷 نامردی

**ناگا / naga/**: ئاوەڵکار. کوت‌وپڕ؛ ناکاو ‹بە نیم نیگای ناز ناگا دیای تۆ/ بە زولف حەبەش پەشێویای تۆ «بێسارانی»› 🇮🇷 ناگاه

**ناگرنگ / nag(i)ring/**: ئاوەڵناو. ناسەرەکی؛ کەم‌بایەخ 🇮🇷 کم‌اهمیت

**ناگوزوری / naguzûrî/**: ناو. نامانگووری؛ دەستەنگی؛ فەقیری 🇮🇷 بینوایی؛ تنگدستی

**ناگوناح / nagunah/**: ئاوەڵناو. بێ‌تاوان؛ بێ‌سووچ 🇮🇷 بی‌گناه

**ناگەوار / nagewar/**: ئاوەڵناو. ناخۆش؛ تاڵ ‹هەواڵێکی ناگەوار و دڵتەزێنە!› 🇮🇷 ناگوار

**ناگەهان / nagehan/**: ☜ ناکاو

**ناڵ / nal/**: ناو. ١. ☜ ناڵ ٢. پرزەی باریکی دوڕ قەڵەمی قامیش ‹نالی مەسەلی حالی لە ئەشکەنجەیی غەمدا/ وەک ناڵە لە نەیدا، وەکوو ناڵە لە قەڵەمدا «نالی»› 🇮🇷 ١. ☜ ناڵ ٢. رشتەی نازک درون قلم نی

**نالایق / nalayiq/**: ☜ ناسزا[٢]

**نالایەنە / nalayene/**: ☜ ناڵین

**نالاییش / nalayîş/**: ☜ ناڵین

**نالبەند / nalbend/**: ☜ ناڵبەند

**نالبەنیش[١] / nalbenîş/**: ناو. کاری نەخش کردن لە قوماش 🇮🇷 کار نقش در آوردن روی پارچه

**نالبەنیش[٢]**: ئاوەڵناو. لە سەر لا خەفتگ 🇮🇷 بر پهلو خوابیده

**نالبیڕ / nalbîr/**: ناو. داری هەنار 🇮🇷 درخت انار؛ ناربُن

**نالجاخ / nalcax/**: ناو. ١. پێمەڕۆکە؛ بێلچە ٢. زەنگن؛ قولینگی زەوی کۆڵین 🇮🇷 ١. بیلچە ٢. کُلنگ

**نالجخ / nalcix/**: ناو. تەور؛ بیور 🇮🇷 تبر

**نالڤەن / nalven/**: ☜ ناڵبەند

**نالک / nalik/**: ناو. ١. قاپقاپ؛ سۆل؛ سەرپایی ٢. کەوشی سووک و بێ‌پاژنە 🇮🇷 ١. دمپایی ٢. نعلین

**نالمکی / nalmikî/**: ناو. سینی پچووک؛ قاوەسینی 🇮🇷 سینی کوچک

**نالن / nalin/**: چاوگ. *[کنایە]* فریو دان 🇮🇷 فریب دادن

**نالنی / nalnî/**: ☜ ناڵە

**نالوس / nalûs/**: ئاوەڵناو. خێخ؛ زبر؛ زوور 🇮🇷 زبر

**نالەبار / nalebar/**: ئاوەڵناو. نەبار: ١. نارێک؛ ناخار؛ بەرز و نزم؛ پڕ لە کەندولەند ٢. ناباب؛ نەباو ‹بەدرەوت و بەکەوت و چەوت و لاری/ بەدکاری، نەیاری، نالەباری! «هەژار، *مەم و زین*»› ٣. ناپۆڕ؛ نەپۆڕ 🇮🇷 ١. ناهموار ٢. ناباب ٣. نتراشیده

**نالەت / nalet/**: ☜ نەعلەت

**نالەنە / nalene/**: ☜ ناڵین

**نالی / nalî/**: ناو. نالی؛ نالیک؛ ناهلیک؛ نوهلیک؛ دۆشەک؛ متێل؛ مرتێل؛ ڕایەخی نەرم بۆ لە سەر خەوتن 🇮🇷 تُشک

**نالیک / nalîk/**: ☜ نالی

**نالین / nalîn/**: ☜ ناڵین

**نالێن / nalên/**: ناو. قاپقاپ؛ سۆلی لە تەختە ☰ نعلین چوبی

**ناڵ / nał/**: ناو. نال: ١. پێلاوی یەکسم ٢. پارچە ئاسنی ژێر پاژنەی کەوش ☰ ١. نعل ستور ٢. نعلچە کفش

▣ **ناڵ کردن**: ١. ناڵ بۆ یەکسم کردن ٢. ناڵ لە کەوش دان ٣. تاشینی لایەکی دار بۆ جووت بوون ٤. *[مەجاز]* فریو دان و دەس بڕین ٥. *[مەجاز]* کەسی بێئاکار ترۆ کردن ☰ ١. نعل بە پای ستور زدن ٢. نعلچە بر کفش زدن ٣. تراشیدن چوب برای جفت شدن با چوب دیگر ٤. فریب دادن ٥. سر جای خود نشاندن

**ناڵان / nałan/**: ئاوەڵکار. ناڵەناڵ؛ بە نکەوە؛ بە نک و ناڵە؛ بە ناڵەوە؛ بە ناڵەناڵەوە؛ بە نک و ناڵەوە ☰ نالان

**ناڵانج / nałanc/**: ☜ ناچار[1]

**ناڵاندن / nałandin/**: ☜ ناڵین

**ناڵانن / nałanin/**: ☜ ناڵین

**ناڵای / nałay/**: چاوگ. ناڵاندن ☰ نالیدن

**ناڵبەکی / nałbekî/**: ناو. ژێرئیستیکان؛ ژێرپیاڵە ☰ نعلبکی

**ناڵبەن / nałben/**: ☜ ناڵبەند

**ناڵبەند / nałbend/**: ناو. ناڵبەن؛ ناڵوەن؛ ناڵبەند؛ سۆڵبەند؛ ناڵڤەن؛ سمتراش؛ کەسێ کە یەکسم ناڵ دەکا ‹هەر بارگیرێکی بە سەرسم فێر بێ/ پێی ئەڵێن یاخوا ناڵبەندت کوێر بێ «پیرەمێرد»› ☰ نعلبند

**ناڵچە / nałçe/**: ناو. ناڵی کەوش ☰ نعلچەی کفش

**ناڵدار / nałdar/**: ناو. یەکسمی سواری ‹ناڵدار هاتووە ناڵی پەڕاندووە، باڵدار هاتووە باڵی وەراندووە «مەسەل»› ☰ چارپای سواری

**ناڵوەن / nałwen/**: ☜ ناڵبەند

**ناڵە / nałe/**: ناو. ناڵنی؛ وت؛ نووزە؛ نکوناڵ؛ ئاخ و ئۆف لە بەر دەرد و خەم ☰ ناله

▣ **ناڵە کردن**: ☜ ناڵین

**ناڵەکی / nałekî/**: ناو. پاژنەی ژێر کەوش ☰ پاشنەی زیرین کفش

**ناڵەناڵ / nałenał/**: دەنگەناو. دەنگی ناڵەی زۆر ‹ناڵەناڵی تێ لەو نەخوەشخانە/ ناڵەی پیر نییە زاڵەی جوانە «فۆلکلۆر»› ☰ نالەی بسیار

**ناڵی / nałî/**: ناو. ناڵی؛ دۆشەکە ☰ تُشک

**ناڵیچە / nałîçe/**: ناو. دۆشەکۆڵە ☰ تُشکچە

**ناڵین / nałîn/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //ناڵیت؛ دەناڵی؛ بناڵە// ناڵاندن؛ ناڵانن؛ ناڵاییش؛ ناڵایەنە؛ ناڵەنە؛ ناڵین؛ ناڵە کردن؛ زمیهتن؛ زمین: ١. لە بەر ئێش و ژان دەنگ بەرز کردنەوە ‹لە ئێشا ناڵین› ٢. کرووزانەوە؛ بزواندنی بەزەیی یان هاودەردی کەسێ، بە شین و ناڵە لە بارودۆخی خۆ گلەیی کردن ‹هە ناڵی! بەڵکوو بیکێشی بە ناڵین/ بناڵە! دامەنیشە مات و مەبهووت! «ناڵی»› ☰ ١و٢. نالیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەناڵین

**نام[1] / nam/**: ☜ نێو ـ١

**نام[2]**: ئامراز. ١. یان؛ یا؛ نا ‹نام تۆ بچۆ نام من دەچم› ٢. نازانم؛ داخوم؛ ئاخۆ ‹نام بۆ نەهات؟!› ☰ ١. یا ٢. راستی

**ناما / nama/**: ئاوەڵکار. ١. دەغیلە ٢. دەی ☰ ١. زینهار ٢. حرف تشجیع

**نامارک / namarik/**: ☜ناموبارەك

**نامارەک / namarek/**: ☜ ناموبارەك

**ناماقووڵ / namaqûł/**: ئاوەڵناو. ١. ناپەسەن؛ نەشیاو ٢. بێقەدر؛ بێفەڕ ٣. نەچێ؛ نەگونجاو. هەروەتا: **ناماقووڵی** ☰ ١. ناپسند ٢. بی‌ارج ٣. نسنجیده

**نامامیەد / namamyed/**: ئاوەڵناو. تازەکار؛ ناشی؛ تازە فێرەکار ☰ تازەکار

**نامانگوری / namangûrî/**: ☜ ناگوزوری

**نامدار / namdar/**: ☜ **نێودار**

**نامراد / nam(i)rad/**: ئاوەڵناو. ناکام ☰ ناکام

**نامرادی / nam(i)radî/**: ناو. ناکامی ☰ ناکامی

**نامردی / namirdî/**: ☜ **ناپیاوی**

**نامرۆڤ / nam(i)rov/**: ☜ **ناپیاو**

**نامزات / namzat/**: ☜ **ناڤدیر**[1]

**نامزەد / namzed/**: ☜ **ناڤدیر**[1]

**نامڤەت / namvet/**: ئاوەڵناو. بەدناو؛ ناوزڕاو ☰ بدنام؛ رسوا

**نامل / namil/**: ناو. ناوشان؛ کۆڵ؛ نێوان هەر دوو پیل ☰ شانه؛ کول

**نامنایەرە / namnayere/**: چاوگ. دانەواندن؛ کۆمەو کردن ☰ خم کردن

**نامەوارەک / nam(i)warek/**: ☜ **ناموبارەك**

**نامویارەک / namubarek/**: ئاوەڵناو. نامارەک؛ نامارک؛ نامەوارەک؛ بەدودم؛ شووم؛ نەحس؛ جووتقۆشە ☰ نامیمون

**نامۆ / namo/**: ئاوەڵناو. بیانی؛ بێگانە؛ غەریبە؛ غەوارە ☰ بیگانه

**نامۆبێز / namobêz/**: ئاوەڵناو. بێگانەبێز؛ بێزار لە بێگانە ☰ بیگانەگریز

**نامۆس / namos/**: ☜ **ناموس**

**نامۆیی / namoyî/**: ناو. بێگانەیی؛ غەریبەیی ☰ بیگانگی

**ناموس / namûs/**: ناو. نامۆس: ١. ئابڕوو؛ شەرەف؛ سەربەرزی ‹ئێمە لەم شەڕەدا ناموسمان پاراست› ٢. *[مەجاز]* ژن، دایک، خوشک یان کچی پیاو کە پاراستنی ئابڕوویانی لە ئەستۆدایە ‹چاوی لە دووی ناموسی خەڵک بووا› ٣. ڕێوشوێن؛ پێودان؛ قانوون؛ یاسا؛ ڕەسم و شێواز ‹زا و مەرگ ناموسی سروشتە› ✱ هەروەها: **ناموسی** ☰ ١. آبرو؛ شرف ٢. ناموس ٣. قانون

**ناموسفرۆش / namûsf(i)roş/**: ئاوەڵناو. *[پەلار]* گرنگی‌نەدەر بە ناموس ‹نە ناموس‌فرۆش نە پوول‌پەرستم/ حەیا و حورمەتم نادەم لە دەستم «موفتی پێنجوێنی»›. هەروەها: **ناموس‌فرۆشی؛ ناموس‌پەرست؛ ناموس‌پەرستی** ☰ ناموس‌فروش

**نامە[1] / name/**: ناو. ١. نەمەک؛ کاغەز؛ دەستنووس؛ نووسراوەیەک بۆ کەسێکی تایبەت و دیاریکراو ‹نامەکەت گەیی نامە بان چاوم/ بە دووریت قەسەم بۆ تۆ تاساوم «فۆلکلۆر»› ٢. نەمەک؛ کاغەزێک کە نامەی تێدا نووسرابێ ‹من ڕۆژگارێک شیعر و نامە دەستخەتییەکانی [سەید ڕەشیدی خانەقا]م کۆ دەکردەوە کە بە ڕاستی لە نرخاندن نایەن «هەژار، چێشتی مجێور»› ٣. کتێب؛ پەرتووک ‹سەرنامەیێ نامە نامێ ئەڵلاھ/ بێ نامێ وی ناتەمامە وەڵڵاھ «خانی»› ٤. ☜ **نێو‌١** ٥. نامیلکە؛ دوانامە؛ نووسراوەی کۆتایی خوێندکاری ☰ ١و٢. نامه ٣. کتاب ٤. ☜ **نێو‌١** ٥. پایان‌نامه

**نامە[2]**: دەنگ. ١. ناما؛ نامەردان؛ دەغیلە ‹قاوەچی گوتی: نامە خۆت بشارەوە! دەستەیەک ژاندارم و شارەبانی هاتن لە تۆیان دەپرسی و ڕەنگە بگەڕێنەوە «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. دەی؛ وشەی دنەدان ‹نامە! ڕاکەن بیگەنێ!› ☰ ١. زنهار ٢. کلمەی تشجیع

**ـ نامە[3]**: پاشەوشە. نووسراوەیەک لەمەڕ مەبەستێکەوە ‹شوناسنامە؛ ڕۆستەم‌نامە؛ سەرنامە› ☰ ـ نامه

**نامەبەر / nameber/**: ناو. پەیک؛ پۆستەچی؛ ئەوەی کاری گەیاندنی نامەیە ☰ نامەرسان

**نامەت / namet/**: ئاوەڵناو. نەهامەت؛ نامەد؛ نەگبەتی ☰ نکبت‌بار

**نامەتش / nametiş/**: چاوگ. ١. لوول‌دان؛ پێچان ٢. با دان؛ هۆندنەوە ☰ ١. پیچاندن ٢. تاب دادن

**نامەحرەم / nameĥrem/**: ئاوەڵناو. ١. *[ئیسلام]* تایبەتمەندی ژنێ کە بە پێی شەرع نابێ پیاوێ

چاوی بە سەر و قــژ و لەشــی بکــەویّ ٢. *[ئیــلام]* تایبەتمەندی پیاویّ کــە شــەرع ڕیّ نــادا ژنێــک دەستی لیّ بکەویّ ٣. دگەر؛ بێگانە؛ تایبەتمەندی کەسیّ کە جیّ بڕوا نییە و نابیّ قســەیەکی لــە لا بکریّ ≡ ١تا٣. نامحرم

**نامەخانە / namexane/**: ناو. کتێبخانە ≡ کتابخانە

**نامــەخوا / namex(i)wa/**: دەنــگ. نـــاوخوا: ١. وشــەی ســەیرمان ‹نامــەخوا! ئــەو چییــە؟› ٢. وشــەیەکە بــۆ خۆشەویســتی شــتێک/ کەســێک دەیڵێن کە لە چاو نەچیّ ≡ ١. وە؛ کلمەی تعجب ٢. کلمەای برای چشم نخوردن (مانند: ماشاءالله)

**نامەد[1] / named/**: ناو. بەدبەختی؛ نامــەدی؛ ڕەوتی خراپ بۆ هاتن ≡ بدبیاری

**نامەد[2]**: ☜ **نامەت**

**نامەدار / namedar/**: ☜ **نێودار**

**نامەدی / namedî/**: ☜ **نامەد[1]**

**نامەرد / namerd/**: ☜ **ناپیاو**

**نامەردان / namerdan/**: ☜ **نامە[2]ـ١**

**نامەردانە[1] / namerdane/**: ئاوەڵناو. دوور لە کــردار و هەڵس‌وکەوتی پیاوانــە ‹گــەر بــە ئــازادی نــەژیم مردن خەڵاتــە بــۆ لەشــم/ نۆکــەری و ســەردانەواندن کاری نامەردانەیە «قانع»› ≡ نامردانە

**نامەردانــە[2]**: ئاوەڵــکار. ناپیاوانـــە؛ بـــە نامـــەردی ‹نامەردانە کوشتیان› ≡ نامردانە

**نامەردی / namerdî/**: نــاو. کار و کردەوەی دوور لە پیاوەتی و مرۆڤایەتی ≡ نامردی

**نامــەڕەســان / nameřesan/**: نـــاو. نامەگـــەیێن؛ پۆستچی؛ پۆستەچی ≡ نامەرسان

**نامەعلوم / name'lûm/**: ئاوەڵناو. کەس‌نەزان؛ لێڵ؛ نارِوون ≡ مُبهم؛ نامعلوم

**نامەگەیێن / namegeyên/**: ☜ **نامەڕەسان**

**نامەی / namey/**: ئاوەڵــناو. کلـــۆڵ؛ بەدبـــەخت ≡ بدبخت

**نامی / namî/**: نــاو. ١. ☜ **نێودار** ٢. **چۆڵــەچرا** ≡ ١. ☜ **نێودار** ٢. نیمسوز

**نامیایەرە / namyayere/**: چــاوگ. دانــەوان؛ کــۆم بوونەوە؛ کۆمەو بوون ≡ خم شدن

**نـــامیزان[1] / namîzan/**: ئاوەڵـــناو. نارِێـــــک: ١. نابەرانبەر؛ ناهەمبەر؛ ناتراز ‹تەرازووی نــامیزان› ٢. ناکۆک؛ تایبەتمەندی ئەو شــتەی ڕێــک نــەکراوە ‹ســـەعاتی نـــامیزان› ٣. شـــێواو؛ تێکچـــوو؛ تایبەتمەنــدی کەســێک وا لــە بــاری ئــاوەزەوە ئاڵۆزاوە. هەروەها: **نامیزانی** ≡ ١تا٣. نامیزان

**نــامیزان[2]**: ئاوەڵــکار. ناتــەواو؛ نارِێــک ‹نــامیزان کــار دەکا› ≡ نامیزان

**نامیلکــە / namîlke/**: نــاو. ١. ســپیارە؛ کتێبۆکــە؛ وتاریّ کە لە زانستگادا لــە لایــەن خوێنــدکارەوە دەنووســرێت ‹نامیلکــەی دوکتــۆرا› ٢. گوتــار؛ نووســراوەیەک بــە ٢٠٠ تــا ٢٠٠٠٠ وشــەوە بــۆ بەڵاڤۆکی دەرەوەیی، دامەزراوەی فێرکــاری یــان کۆڕێکی زانستی و پیشەیی کە تێیدا نووسەر بــیر و ڕای خــۆی لەمــەڕ بابەتێکــەوە دەربــڕیوە ‹ئــەم نامیلکەی دوکتــور عــەلی شــەریعەتییەت پێشــکەش دەکەین، بیخوێنەوە! وەردیدەوە! وردی‌کــەوە! لێــی وردبەوە! «هــەژار، چــوار *نامیلکــە*»› ≡ ١. رســاله ٢. مقاله

**نامییە / namîye/**: ☜ **نێودار**

**نــان[1] / nan/**: چــاوگ. تێــپەر. *//نــات؛ دەنێــی؛ بنــیّ// نیان*: ١. چەقانــدن ‹دارم نــاوە› ٢. دانــان؛ شــتیّ خستنە سەر شتیّ ‹نامە سەرم› ٣. تــیّ‌ڕۆ کــردن ‹چت لە گیرفانت ناوە؟› ٤. جارێک بە دار لە تــۆپ دان لە کایەی تۆپقاڕدا ‹نام پێــوەی› ≡ ١. غــرس کردن ٢. نهادن ٣. تو نهادن ٤. توپ را با چــوب زدن در بازی

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەنان

**نــان[2]**: ناو. نانە؛ نوو؛ نۆ؛ نۆن؛ نوون؛ نو: ١. بەرهەمی

ئاردی دە ئاو شێلدراوی پانەوەکراوی بە ئاگر برژاو ‹نانێک کەمتر بخۆ، برسییەک تێر کە! «قسەی نەستەق»› ٢. */کینایە/* پێخۆر و خۆراکی ڕۆژانە ‹خەریک بووم نانم دەخوارد، هاتنە سەرم› ٣. */کینایە/* بژیوی ژیان ‹دەبێ کار بکەین و نان دەربێنین› ٤. داهات؛ مووچە ‹کێ بە نانی کارمەندی دەژی؟!› ⚐ ١و٢. نان ٣. روزی ۴. درآمد

▣ **نان برنشک:** داروو کەیێکی لە تیرۆک باریک‌تر کە نانی سەر ساجی پێ ئەودیو ـ ئەمدیو دەکەن ⚐ نان برشک

**نان بەیات:** ☜ **نان پەزێرە**

**نان پرسە:** چێشت و نانێ کە لە سەرەخۆشیدا دەدرێ بە خەڵک ⚐ غذایی کە در مجلس عزا توضیع می‌شود

**نان پەزێرە:** نان بەیات؛ نانی کۆن کە شەوی بە سەردا هاتبێتەوە ⚐ نان بیات

**نان تیری:** ☜ **نانی تیری**

**نان جەژن:** ☜ **نانی جێژن**

**نان چلە:** خۆراکێ کە لە بیرەوەری چل ڕۆژەی مردوودا دەدرێ ⚐ طعام چهلم متوفی

**نان حەفتە:** خۆراک و میوانی دان، حەوتەیەک پاش گوازتنەوەی بووک ⚐ سور هفتەی بعد از عروسی

**نان خاڵی:** ☜ **نانی ئیشکی**

**نان خەتەنە:** خەتەنەسووران ⚐ ختنەسوران

**نان ساجی:** ١. نان سێر؛ نانێ ساجی؛ نانێ سێڵێ؛ نانێ کە بە سێڵی دەکەن ٢. ناوساجی؛ جۆرێ کولێرە کە لە ناو تەشتدا بە ڕۆن سووری دەکەنەوە ⚐ ١. نان ساجی ٢. گردەی ساجی

**نان سەنگەک:** نانێ کە لە سەر چەوی سوورەوەبوو دەبرژێ ⚐ نان سنگک

**نان سێر:** ١. ☜ **نان ساجی ـ١** ٢. مەنجەڵی سەرقەپاخدار ⚐ ١. ☜ **نان ساجی ـ١** ٢. دیگ سرپوش‌دار

**نان گەنمی:** کولێرە چەورە ⚐ نان روغنی

**نان وشکی:** ☜ **نانی ئیشکی**

**نان وەوی:** نانە وەوی؛ چێشت و نانێ کە سێ ڕۆژ لە ماڵەبابی بووکەوە بۆ ماڵ زاوای دەنێرن ⚐ غذایی کە سە روز از خانەی پدر عروس بە خانەی داماد فرستند

**نانا تیرە:** ☜ **نانی تیری**

**نانا ڤەیڤەک:** ☜ **نانی زەوماوەند**

**نانا ڤەیڤی:** ☜ **نانی زەوماوەند**

**نانا ڤەیەک:** ☜ **نانی زەماوەند**

**نانا ڤێک:** ☜ **نانی زەوماوەند**

**نانۆ پاتیرە:** نانی هەڵنەهاتوو ⚐ نان فطیر

**نانۆ وشک:** ☜ **نانی ئیشکی**

**نانە وەوی:** ☜ **نان وەوی**

**نانی ئیشک:** ☜ **نانی ئیشکی**

**نانی ئیشکی:** نان خاڵی؛ نان وشکی؛ نانۆ وشک؛ نانی ئیشک؛ نانی بتەرسی؛ نانێ پاتی؛ نانێ پەتی؛ نانێ تەرسی؛ نانێ وشکە؛ نوون‌پەتی؛ نانی بەبێ پێخۆر ⚐ نان خالی

**نانی بتەرسی:** ☜ **نانی ئیشکی**

**نانی پووە:** نانی جۆ و بەڕوو ⚐ نان بلوط و جو

**نانی تەنوری:** نانێ تەندووری؛ نانێ کە بە تەندوور برژابێ ⚐ نان تنوری

**نانی تیری:** نان تیری؛ نانا تیرە؛ نانێ تیرە؛ نانی تەنک کە بە تیرۆک پان دەکرێتەوە ⚐ نان لواش

**نانی جێژن:** */کینایە/* نان جەژن؛ چێشتێ کە لە جەژندا لێ دەنرێ ⚐ غذای عید

**نانی دەرۆزەیی:** ☜ **نانی سواڵ**

**نانی زەماوەند:** */کینایە/* نانا ڤەیڤەک؛ نانا ڤەیڤی؛ نانا ڤەیەک؛ نانا ڤێک؛ چێشتێ کە لە زەماوەندا دەخورێ ⚐ غذای عروسی

**نانی سواڵ:** *[کینایە]* نانی گەدایی؛ نانی دەرۆزەیی؛ پووڵ و پارەیێ کە بە گەدایی دەس بکەوێ ☰ نان گدایی

**نانی زەماوەند:** *[کینایە]* نانا ڤەیڤەک؛ نانا ڤەیڤی؛ نانا ڤەیەک؛ نانا ڤێک؛ چێشتێ کە لە زەماوەندا دەخورێ ☰ غذای عروسی

**نانی شەو:** *[کینایە]* کەمترین پێخۆری پێویست بۆ ژیان ‹بەلام بۆ مەسیح دەڵێی چی کە هەتا کوژراوە نانی شەوی نەبوو و بە پێخواسی و بە سواری کەر گەڕاوە؟ «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ قوت لایموت

**نانی گەدایی:** ☜ **نانی سواڵ**

**نانی لەفە:** سەموون؛ نانی باگیت؛ نانێکی درێژی گرۆڤەرە لە ئاردی سپی دروستی دەکەن ☰ نان باگت

**نانێ پاتی:** ☜ **نانی ئیشکی**

**نانێ پەتی:** ☜ **نانی ئیشکی**

**نانێ تەرسی:** ☜ **نانی ئیشکی**

**نانێ تەندووری:** ☜ **نانی تەنوری**

**نانێ تیرە:** ☜ **نانی تیری**

**نانێ چووچک:** نانکێ چووچکا؛ نانکێ چویکا؛ نانێ مێچکا؛ نانێ چووک؛ نان‌حاجی‌لەق‌لەق؛ نانەحاجی‌لەگ‌لەگ؛ نانەحاجی‌لەک‌لەک؛ نانەحاجیلە؛ پەپکە؛ تۆڵک؛ تۆڵەکە؛ چێچێ؛ قەڕەتوورە؛ گیایەکی یەکسالانەیە بنێکی سپی گۆشتن و لەقێکی ڕاست و لووس و گەڵای پەنجەئاسای هەیە، بە گوڵی سپی ئامال بەنەوشەوە ☰ پنیرک

**نانێ چووک:** ☜ **نانێ چووچک**

**نانێ دەزێ:** نانی کۆنی برشاوی ☰ نان کهنە و کپک‌زدە

**نانێ ساجی:** ☜ **نان ساجی ـ١**

**نانێ سێلێ:** ☜ **نان ساجی ـ١**

**نانێ شڤانی:** ☜ **نانێ شوانی**

**نانێ شکەڤا:** ناسکە نان ☰ نان تُرد و نازک

**نانێ شوانی:** نانێ شڤانی؛ دەمووکانە ☰ مویزک عسلی

**نانێ لەواشە:** نانێ گرۆڤەر؛ کولێرەی تەنک ☰ نان تافتونی

**نانێ مێچکا:** ☜ **نانێ چووچک**

**نانێ مێزنی:** نانی ئەستووری هەویرهەڵاتوو ☰ نان کلفت

**نانێ مێشا:** ☜ **نانێ هەنگڤی**

**نانێ هلاتی:** نانێ کە هەویرەکەی هەڵاتووە ☰ نان خمیر برآمدە

**نانێ هەلتێ:** کولوچەی پڕ لە گوێز کراو ☰ کلوچەی آگنە از مغز گردو

**نانێ هەنگڤی:** نانێ مێشا؛ شانەی هەنگوین ☰ شانەی عسل

⊡ **نان براژتن:** ☜ **نان کردن**

**نان برین:** *[کینایە]* بێ‌بەش کردن لە بژیو ☰ نان بُریدن

**نان بە ساجەوە بون:** *[کینایە]* پەلە بوون؛ کات و دەرفەتێکی کەم بۆ کارێ هەبوون ☰ فُرصت زیادی نداشتن

**نان بە ساجەوە سوتان:** *[کینایە]* دەرفەت فەوتان و کار لە کار ترازان ☰ کار از کار گذشتن

**نان پاتن:** ☜ **نان کردن**

**نان پێژان:** ☜ **نان کردن**

**نان پێوەدان:** ئەنگوتک بە تەنوورەوە لکاندن ☰ نان بر تنور زدن

**نان خواردن:** ١. ژەمەن کردن ٢. *[کینایە]* بەڕێوە چوونی ژیان ‹لە ولاتی ئێمە، نووسەری سەربەست ناتوانێ بە قەڵەمەکەی نان بخوات› ☰ ١. غذا خوردن ٢. گذراندن معیشت

**نان دان:** ١. ڕزق و ڕۆزی دان ‹خودا نان دەدا›

٢. خۆراک بـە فـەقیران بەخشـین ⇐ ١. روزی دان ٢. اطعام کردن

**نان کردن:** نان بـراژتن؛ نـان پـاتن؛ نـان پێـژان؛ ئەنگوتک بە تەنوورەوە دان و برژانـدنی ⇐ نـان پُختن

**نانی سەگ پێ دان:** *[کینایە]* زۆر بـە نارەحـەتی و کەم و کوورییەوە بـەخێو کـردن ⇐ بـا منّـت و تحقیر پروردن

**نانی شەو شک نەبردن:** *[کینایە]* نانی شەو نـەبوون؛ زۆر نەدار بوون ⇐ نان شب نداشتن

**نانی شەو نەبوون:** ☜ **نانی شەو شك نەبردن**

**نانێ قەتش:** *[مەجاز]* ژیان بە فەقیری و نان‌براوی بردنە سەر ⇐ بە سختی امرار معاش کردن

**نانێ لەگەڵ یەکدا خواردن:** *[کینایە]* خـۆی یـەکتر گرتن ⇐ تاثیر پذیرفتن از خوی و اخلاق همدیگر

**بۆ نـانی شەو دامان:** *[کینایە]* زۆر ئاتـاج بـوون ⇐ محتاج نان شب بودن

**نـانـا / nana/:** نـاو. ١. سـەوادە؛ پێـرۆ؛ پیـادە ٢. پیادەڕێ؛ پیادەڕۆ ⇐ ١. پیادە ٢. راه پیادەرو

**نانانە / nanane/:** نـاو. ئەو بەراتەی لە بـاتی نـانی ژەمەکان بە ڕەنجبەر دەدرێـت ⇐ مبلغـی کـە بـە جای نان سە وعدە بە رنجبر دادە می‌شود

**نان‌بدە / nanbide/:** ناوەلناو. ناندە؛ نانده‌ر؛ دەهندە؛ بەخشندە ⇐ سخی؛ بخشندە

**نان‌بـــدەیی / nanbideyî/:** نـــاو. ســـــەخاوەت؛ بەخشندەیی؛ دلاوایی ⇐ بخشندگی؛ سخاوتمندی

**نـان‌برنجی / nanb(i)rincî/:** نـاو. جـۆرێ شـیرینی کە لە ئاردەبرینج و شەکەر و ماکی بۆنخۆش چێ دەکرێ ⇐ نان‌برنجی

**نان‌برێژ / nanb(i)rêj/:** ☜ **نانەوا**

**نان‌برێشـک / nanb(i)rêş(i)k/:** نـاو. ناوبرێشـــک؛ نێوبرێشک؛ دارۆکەیەکی لە تێـرۆک بـاریکتر کـە نانی سەر ساجی پێ ئەو دیو ئەم دیو دەکـەن ⇐ چوبکی کە نان را با آن از روی ساج برگردانند

**نان‌بڕ / nanbiř/:** ناوەلناو. *[کینایە]* هۆی بڕانی نـانی کەسێ. هەروەها: **نـان‌بـڕی** ⇐ عامـل قطـع روزی کسی

**نان‌براو / nanb(i)řaw/:** ناوەلناو. *[کینایە]* بـێ بـەش کراو لە بژیو ‹هاتن فێرمان کەن چۆن مەدەنی بین/ چـۆن نـان‌بـراوی دەسـتی دەنی بـین! «هـەژار، *بـۆ کوردستان*»› ⇐ محروم شدە از روزی

**نـان‌بژێر / nanb(i)jêr/:** نـاو. ١. ☜ **نانـــەوا** ٢. *[کینایە]* مرۆی لە ماڵەخۆ ڕەزیلی ئەنگوتک‌بژێـر ⇐ ١. ☜ **نانەوا** ٢. کسی کە در خانەی خـود خساسـت می‌کند

**نانبەن / nanben/:** ناو. ڕفێدە؛ مادە؛ مایە ⇐ رفیدە

**نان‌پات / nanpat/:** ☜ **نانەوا**

**نان‌پەیداکەر / nanpeydaker/:** ☜ **نودەرار**

**نـان‌پیزە / nanpîze/:** ناو. نانـەزگ؛ کرێکـاری بـێ کرێ و هەر بە خواردن ⇐ کارگری کە فقط غذایش بدهند

**نان‌پێژ / nanpêj/:** ☜ **نانەوا**

**نان‌پێوەدەر / nanpêweder/:** ناو. شاتر؛ کەسێ کـە ئەنگوتک بە تەنوورەوە ئەلکێنێ ⇐ شاطر

**نان‌تاڵ / nantał/:** ناوەلـناو. *[مـەجاز]* چنـۆک؛ ڕژد و چرووک ⇐ خسیس

**نانجە / nance/:** نـاو. دەلاقە؛ ڕۆچنــە ⇐ دریچـەی کوچک

**نان‌چایی / nançayî/:** ناو. جۆرێ نانی شـیرین بـۆ بەیانییان ⇐ نان شیرینی صبحانە

**نان‌حاجی‌لـەقـلـەق / nanĥacîleqleq/:** ☜ **نـانێ چووچك**

**نـان‌خۆر / nanxor/:** نـاو. *[کینایـە]* خێـزان؛ مـاڵ و منداڵ؛ کەسانی ژێر سەرپەرشتی گـەورەی مـاڵ ‹سێ نان‌خۆرین لە ماڵا› ⇐ عائلە

**نان‌خۆرشت / nanxorişt/:** نـاو. پێخـۆر؛ ئـەوەی بـە

نانەوە دەیخۆن 🇮🇷 نانخورش

**ناندان / nandan/:** ناو. نانـدێن؛ نـانگێن؛ دۆڵـە/ تەبەكی نان 🇮🇷 ظرف نان

**ناندرو / nand(i)rû/:** ناو. دروێنەوان؛ درەوكـەری دەخڵ 🇮🇷 دروگر

**ناندۆز / nandoz/:** ناوەڵناو. ماندوو بـۆ نـان پەیـدا كردن 🇮🇷 زحمتكش

**نانده / nande/:** ☜ **نانبده**

**نانده‌ر / nander/:** ☜ **نانبده**

**نانذێن / nandên/:** ☜ **ناندان**

**نانساجی / nansacî/:** ☜ **ناوساجی**

**نانقەیسی / nanqeysî/:** ناو. نانەقەیسـی؛ خـەروا؛ قەمەردین؛ میوەی پانەوەكراوی ئیشكەوەكراو لـە بەر تاو، بەتایبەت قەیسی 🇮🇷 لواشک

**نانک / nanik/:** ناو. ۱. پلوورەهەنگ؛ شلـخەمێش ۲. كەلانە؛ كێلانە 🇮🇷 ۱. نسل نوین زنبـور عسـل ۲. نوعی نان روغنی كه سبزی‌های معطر در آن می‌ریزند

◙ **نانكێ چویكا:** ☜ **نانێ چووچك**

**نانكێ چووچكا:** ☜ **نانێ چووچك**

**نانكێ مەویژا:** كولیرەیێ كشمیشی تێ كرایێ 🇮🇷 گردەنانی كه آگنه‌اش كشمش باشد

**نانكێ هەژیرا:** نانەهەنجیر 🇮🇷 لواشک انجیر

**نانكا / nanka/:** ئاوەڵكار. ئیسـە؛ نهـۆ؛ نووكـە 🇮🇷 الآن؛ هم‌اكنون

**نانكوێر / nank(i)wêr/:** ☜ **كوێرنان**

**نانكۆر / nankor/:** ☜ **كوێرنان**

**نانكەر / nanker/:** ناو. نانپێژ 🇮🇷 نان‌پز

**نانكەرەوە / nankerewe/:** ناو. كەسێ كه ئەنگوتک بە تیرۆک پان دەكاتەوە 🇮🇷 كسی كه با چوب چونه را پهن می‌كند

**نـانگر / nangir/:** ئاوەڵـناو. نـانگیر؛ بـەرێژەو 🇮🇷 پُرحاصل

**نانگیر / nangîr/:** ☜ **نانگر**

**نانگێن / nangên/:** ☜ **ناندان**

**نانماڵ / nanmał/:** ئاوەڵناو. [مەجاز] خۆژیو؛ خۆژی؛ بێ‌نیاز لە كەس 🇮🇷 خودكفا

**نانمكی / nanm(i)kî/:** ناو. نالمكی؛ سینی پچووک 🇮🇷 سینی كوچک

**نانەخۆر / nannexor/:** ئاوەڵناو. [كینایە] چـرووک؛ ڕژد؛ چكووس؛ دەس‌قووچاو 🇮🇷 خسیس

**نانونـاو / nan û 'aw/:** ناو. [كینایە] ۱. بژیو؛ مایـەی ژیان ۲. پێخۆر 🇮🇷 ۱. مایەی زندگی ۲. خوراک

**نانوچا / nan û ça/:** ناو. [كینایە] نـان و چـایی: ۱. چاشت؛ خـواردنی بـەیانی ۲. ژەم؛ ژەمـەن 🇮🇷 ۱. صُبحانه ۲. وعدەی غذا

**نانوچایی / nan û çayî/:** ☜ **نانوچا**

**نانوحەلوا / nan û ĥelwa/:** ناو. [كینایە] كـاری زۆر هاسان 🇮🇷 كار بسیار آسان

**نانوخ / nanux/:** ☜ **نینۆك**

**نـانودۆبڕ / nan û dobiř/:** ئاوەڵناو. [كینایە] شـووم و پێ‌ڕەش 🇮🇷 نحس

**نـانودۆبڕە / nan û dob(i)ře/:** نـاو. دۆبـــڕە؛ خاشخاش؛ مەنگەگیا؛ جۆرێک گوڵاڵـە سـوورە 🇮🇷 خشخاش

**نانوزگ / nan û zig/:** ☜ **نانەزگ**

**نانوسۆل / nan û sol/:** ناو. [كینایە] نـان و خـوێ؛ بژیو 🇮🇷 مایەی زندگی

**نانونمەک / nan û n(i)mek/:** نـاو. [كینایە] پێخـۆر یان بژیوی دابین‌كراو بە یارمەتی یـان بـە هـۆی كەسێک 🇮🇷 نان‌ونمک

◙ **نان و نمەک كردن** ☜ **نمەك كردن ـ۲**

**نانۆ[1] / nano/:** نـاو. زانست و لێهاتوویی كار كـردن بـە مـاكی یـەكجار ورد، بـۆ دروسـت كـردنی ئامرازگەلی زۆر ڕێک و هەستۆک 🇮🇷 نانو تكنولُژی

**نانۆ[2]:** ئاوەڵناو. نانخۆری بێكارە 🇮🇷 نان‌خور بیكاره

**نانۆخگیر / nanoxgîr/:** ☜ **نینۆكبڕ**

**نانوخ / nanûx/:** ☜ **نینۆك**

**نانه / nane/:** ☜ **نان**[٢]

**نانەبەره / nanebere/:** ناو. دەفری نـانی ڕێبـوار و شوان و دەشتەکی ☲ توشەدان مسافر و چوپان

**نانە پەچ / nanepeç/:** ☜ **نانەوا**

**نانـەجیب / nanecîb/:** ئاوەڵـناو. ١. نارەســـەن؛ بەدرەسەن ‹ئەسپی نانەجیب› ٢. ناکـەس بەچـە؛ بـێئاکـار ‹کـابرای نانـەجیب نـانێکی نـەداین› * هەروەها: **نانەجیبی** ☲ ١. بدگُهر ٢. نانجیب

**نانەحاجیلە / naneĥacîle/:** ☜ **نانێ چووچك**

**نانەحاجیلەکلەک / naneĥacîleklek/:** ☜ **نانێ چووچك**

**نانەحاجیلەگلەگ / naneĥacîlegleg/:** ☜ **نانێ چووچك**

**نانەخـوس / nanexûs/:** نـاو. *[کینایـە]* ڕزق و ڕۆزی هاسان و پرمنەت ‹نە بەرتیل‌خۆر بە! نە دوعـانووس بە!/ نە نۆکەر ئاغا بۆ نانەخووس بە! «قانع»› ☲ روزی آماده و زیرِ بارِ منّت

**نانەڕەق / naneřeq/:** ☜ **نانەڕەقە ـ١**

**نانـەڕەقــە / naneřeqe/:** نـــاو. ١. نانــــەڕەق؛ لـەتوپـەتی ئیشـک و ڕەق‌هـەلاتووی نـان ٢. چێشـتی پارچـە نـانی ڕەق و ڕۆن و ئـاو ☲ ١. نان‌خشکه ٢. آشی است

**نانـەزگ / nanezig/:** نـاو. نـان‌وزگ؛ نانـەزگێ؛ نانەسک؛ نانەسکی؛ نانەسکێ؛ نانەلـەم؛ کرێکـاری هـەر بـە خـۆراک ‹بـە نانـەزگ کـارم دەکـرد› ☲ کارگری در ازای فقط خوراک

**نانەزگێ / nanez(i)gê/:** ☜ **نانەزگ**

**نانەسک / nanesik/:** ☜ **نانەزگ**

**نانەسکی / nanes(i)kî/:** ☜ **نانەزگ**

**نانەسکێ / nanes(i)kê/:** ☜ **نانەزگ**

**نانەشان / naneşan/:** ناو. سەلە؛ سـەبەتەی پـانی وەک سینی ☲ سبد طبقی

**نانەقەیسی / naneqeysî/:** ☜ **نان‌قەیسی**

**نانەلەم / nanelem/:** ☜ **نانەزگ**

**نانەمریچلە / nanem(i)rîçle/:** ناو. کوللێره بـەڕۆن ☲ نان روغنی

**نانەوا / nanewa/:** نـاو. نان‌برێژ؛ نان‌بژێر؛ نان‌پـات؛ نـان‌پێـژ؛ نانکـەر؛ نانەپـەچ؛ شـاتر؛ کەسـێ کـە ئەنگوتک بە تەنوورەوە ئەدا ☲ نانوا

**نانەواخانـە / nanewaxane/:** نـــاو. نانــــەوایی؛ دووکانی تایبەتی نان پێژان ☲ نانوایی

**نانەوایی / nanewayî/:** ☜ **نانەواخانە**

**نانەوە / nanewe/:** چاوگ. تێپەڕ. //ناتەوە؛ دەنێیەوە؛ بنێوە// نیانەوە: ١. بەرپا کردن ‹ئـاژاوە نانـەوە› ٢. دانان بە دزییەوە ‹تەڵە نانەوە› ٣. هێلکـە لـە بـن مریشـکەکورک دانــان ‹مریشـک نانـەوە› ٤. دە بـەرچاو گـرتن و هەڵـبژاردن بـۆ مەبەسـتێ ‹ژن نانەوە› ☲ ١. برپا کردن ٢. چیزی را دزدکی در جـایی نهادن ٣. تخـم زیـر مـرغ کـرچ گذاشـتن ۴. در نظـر گرفتن برای منظوری

■ ناوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەنانەوە

**نانەهــەنجیر / nanehencîr/:** نـــاو. هــــەنجیری پانـەوەکراوی وشـکەوەکراو وەک نانەقەیسـی ☲ لواشک انجیر

**نانی / nanî/:** ئاوەڵـناو. نانی‌نانی؛ ناڕاستەکی و هەر بـۆ نـان خـواردن و ڕابـواردن (دۆسـت) ☲ نـانی (دوست)

▣ **نانی نانی:** ☜ **نانی**

**ناو**[١] **/ naw/:** ناو. ١. نێو؛ ناڤ؛ دروشـمـی ناسـینی هەر شتێ ‹مـەرگ و ژیـن میسـلی سـێبەر و تـاوە/ ئەوی باقی بمێنێ هەر ناوە «حاجی قـادر»› ٢. دوڕ؛ ناوەڕاست ‹ناوەکەی هەڵکۆڵە› ٣. دەنـک؛ کـاکڵ؛ ناوک ‹ئەم گـوێزە نـاوی تیـا نـەبوو؛ شـەلانی خـۆی خۆشە و ناوەکەشی خۆشە› ٤. کاکڵ؛ هـەرچی لـە ژێـر تێکولــەوەیە ٥. دۆلاش؛ نـاوی ئاســیاو ٦.

ناوچە؛ مەڵبەند ٧. ناوە؛ ئاخندراوی دوور شتێ ‹کەواکەت ناوی تێدا نییە› ٨. ناوەوە ‹ناو و دەری بپشکنە!› ٩. ناوەند؛ ناوین ‹ناو شار› ≡ ١. نام ٢. وسط؛ میان ٣. مغز و هسته (میوه) ۴. هر چیزی کە زیر پوستە و پوست قرار دارد ۵. ناو آسیا ۶. منطقە؛ ناحیە ٧. آگنە ٨. تو؛ درون ٩. مرکز

▣ **ناو گەورە و شار وێران:** /کینایە/ دەهۆڵی هەرۆڵ؛ کەس یان ناوەندێ کە نێوبانگی گەورەی هەیە بەڵام لە نزیکەوە وا نییە ≡ طبل توخالی

**ناوی بازرگانی:** ناوێک کە بۆ ناسینەوەی کالایەک بۆی داندراوە ≡ نام تجاری

**ناوی زانستی:** ناوێ کە لە بوارێکی زانستیدا بۆ شتومەک و دیاردەکان دادەنرێت ≡ نام علمی

▣ **ناو بردن:** ناو هێنان/ هاوردن/ هانین: ١. ناف برن؛ باس کردن ٢. /کینایە/ خراپە گوتنی پاش ملە؛ غەیبەت کردن ٣. ناودێر کردن بۆ کارێ ‹بۆ نوێنەری پارلەمان، ناوی ئەویشیان بردووە› ≡ ١. نام بُردن ٢. غیبت کسی را کردن ٣. نامزد کردن برای کاری

**ناو داخستن:** ناو دەرکردن؛ ناوبانگ دەرکردن ≡ مشهور شدن

**ناو دان:** ١. ناو بردن؛ ناوی کەس یان کەسانێ گوتن ‹هەرچی دەکەین ناو نادا کە کێ ئەمەی کردووە› ٢. هان/ دنەدان ≡ ١. نام کسی را ذکر کردن ٢. تحریک کردن

**ناو دەرکردن:** ☜ **ناو کردن ـ١**

**ناو زڕان:** ئابڕوو چوون؛ ناو بە خراپی دەرچوون. هەروەها: **ناو زڕاندن** ≡ آبرو رفتن

**ناو کردن:** ١. ناو دەرکردن؛ بەناوبانگ بوون ٢. مابەین دوور خستنەوە ٣. کاکڵ کردن ‹بادەم ناوی کردووە› ≡ ١. شُهرت یافتن ٢. فاصله گرفتن ٣. شکل گرفتن هستەی میوه

**ناو کوێر بونەوە:** ناو کۆرەوە بوون: ١. لە بیر خەڵک چوونەوە ٢. /کینایە/ بێعەولاد مردن ≡ ١. فراموش شدن ٢. بی وارث مُردن

**ناو کۆرەوە بون:** ☜ **ناو کوێر بونەوە**

**ناو گرتنەوە:** ناوی کەسایەتییەک لە منداڵ نان ≡ نام شخصیّتی را بر نوزادی نهادن

**ناو لێنان:** ناو نان/ نیان؛ ناف دانین؛ ناف لێ کرن؛ ناو بۆ کەسێ یان شتێ دیتنەوە ‹نیشتمان! من ناوت لێ ئەنێم گلمتکێ/ ئەوەندەی لە مشتی شیعرێکما تۆ جێگەت بێتەوە «شێرکۆ»› ≡ نام نهادن

**ناو مان:** لە بیر نەچوونەوە ≡ فراموش نشدن

**ناو نان/ نیان:** ☜ **ناو لێنان**

**ناو نوسین:** نووسینی ناو لە شوێنێکدا بۆ بەشداری کردن لە کارێک ≡ نام نوشتن

**ناو هێنان/ هاوردن/ هانین:** ☜ **ناو بردن**

**ناوا برن:** ☜ **لە ناو بردن**

**لە ناو بردن:** فەوتاندن؛ ناوا برن؛ لە بەین بردن ≡ از میان بُردن

**لە نا چون:** لە بەین چوون؛ فەوتان ≡ از بین رفتن

**لە ناودا نەمان:** لە ئارادا نەمان. هەروەها: **لە ناودا نەبوون** ≡ فراموش شدن

**ناو**[2]: ناوەلکار. ١. نا؛ وەڵامی پێچەوانەی پرسیاری کەسێک ‹چوویە شار؟ ناو› ٢. هانە؛ وشەی دنە ‹ناو تێ دان› ٣. ناوەوە؛ دەروون ‹بچۆ ناو› ≡ ١. نه ٢. حرف تشجیع ٣. داخل

**ناو**[3]: پیت. ماوە؛ مەودا ‹ناو ئێرە و شار دوو سەعاتە ڕێیە› ≡ مابین

**ناو**[4]: پێشوشە. دەروون ‹ناوپڕ؛ ناوهولۆڵ› ≡ تو-

**-ناو**[5]: پاشەوشە. ١. ـ ئەندوو؛ ـ ساو ‹بانەناو› ٢. ـ نیا ‹پێناو› ≡ ١. ـ اندود ٢. ـ گُذار

**ناوئاخن** /naw'axin/: ☜ **ناواخن**

**ناواخن** /nawaxin/: ناو. ناوئاخن؛ نێوئاخن؛

نێواخن؛ شتێ کە ئەخرێتە دوڕ شتێکی ترەوە ‹ناواخنی سەرین تووکە› ☰ آگنه

**ناوارە / naware/:** ناو. داری ئاسۆیی نێوان دوو داری ئەستوونی (وەک: هی نەردیوان) ☰ چوب‌های افقی واصل دو چوب عمودی (مانند: نردبان)

**ناوازە[1] / nawaze/:** ناوەلناو. ١. ناویزە؛ بژاردە ‹گولدانێکی پڕ لە وشە و/ ڕستێ بازنی ناوازە و/ چەند ئاخێکی ڕەنگاوڕەنگی/ بۆ هێنابووم «شێرکۆ»› ٢. کەموێنە؛ هەڵاوێردە ☰ ١. برگزیده ٢. استثنایی

**ناوازە[2]:** ☜ **نەخوازە**

**ناوان / nawan/:** ناو. مەڵبەند؛ ناوچە ☰ ناحیه

**ناوانی / nawanî/:** ☜ **ناوەندێتی ـ١**

**ناوای / naway/:** چاوگ. ناوین؛ تێ کردن ☰ اندودن

**ناوبار / nawbar/:** ☜ **نێوبار**

**ناوباژێڕ / nawbajêř/:** ناو. ناوشار؛ ناوەندی شار ☰ مرکز (شهر)

**ناوبانگ / nawbang/:** ناو. ناڤدەنگ؛ ناڤودەنگ؛ نێوبانگ؛ ناو و دەنگ؛ دەنگ و ناو. هەروەها: **ناوبانگ داخستن؛ ناوبانگ دەرکردن** ☰ شُهرت

**ناوبجی / nawb(i)cî/:** ☜ **ناوبژی**

**ناوبراو / nawb(i)raw/:** جێناو. ناڤبری؛ ناڤبۆری؛ ناوبریاگ؛ نێوبراو؛ ناڤ گوتراو؛ باسکراو ☰ نامبُرده

**ناوبرۆ / nawb(i)ro/:** ناو. ناڤبڕ؛ نێوان دوو برۆ ☰ میان ابروان

**ناوبریاگ / nawbiryag/:** ☜ **ناوبراو**

**ناوبرێشک / nawb(i)rêşk/:** ☜ **نان‌برێشک**

**ناوبڕ / nawbiř/:** ناو. ناڤبڕ؛ نێوبڕ: ١. ناوبڕە؛ تیغە؛ لەمپەر ٢. نزیک‌ترین ڕێ بۆ گەیشتن ٣. پارچە شانۆیەکی کورت لە نێوان دوو بەشی بەرنامەیەکدا ☰ ١. تیغه ٢. میانبُر ٣. وله؛ میان‌برنامه

**ناوبڕاو / nawb(i)řaw/:** ناوەلناو. ناوبڕیاگ؛ لەبیرکراو ☰ فراموش شده

**ناوبڕە / nawb(i)ře/:** ☜ **ناوبڕ ـ١**

**ناوبڕیاگ[1] / nawbiřyag/:** ناو. ناودێر بۆ کارێ ☰ نامزد برای کاری

**ناوبڕیاگ[2]:** ☜ **ناوبڕاو**

**ناوبژە / nawbj(i)e/:** ناو. شیلە؛ ددانی شیری حەیوان ☰ دندان شیری دام

⊡ **ناوبژە کردن:** کەوتنی ددانی شیلە ☰ افتادن دندان شیری دام

**ناوبژی / nawb(i)jî/:** ناو. ناوجی؛ ناوجێ؛ ناونجی؛ مەنجی؛ ناڤچی؛ ناوبجی؛ نێونجی؛ نێوبژە؛ نێوبژی؛ ناڤبژی؛ ناڤبەرکار؛ ناڤچیت؛ بەریوان؛ بەریڤان؛ بەرەڤان؛ بەڕەڤان؛ بەیس؛ بێس؛ هەجاس؛ هاجاس: ١. ناوجیگەری؛ کاری نێوان کردن؛ کەوتنە نێوان دوو یان چەند دژەوە بۆ ئاشت‌کردنەوەیان ٢. ناڤبژی‌کەر؛ ناوبژیکەر؛ نێوبژیکەر؛ ناوبژیکار؛ نێوبژەکەر؛ نێوبژیوان؛ ناوجیکار؛ ناوجیکەر؛ ناوجێکەر؛ نێوانجیکەر؛ ناوەندیار؛ هاجاس‌کەر؛ کەسێ کە تێدەکۆشێ دوو دژ ئاشت کاتەوە و شەڕ و کێشەیان داکوژێنێ. هەروەها: **ناوبژی کردن** ☰ ١. میانجیگری ٢. میانجی

**ناوبژیکار / nawb(i)jîkar/:** ناو. بەرەڤان؛ نێونجی؛ نێوبژە ☰ میانجی

**ناوبژیکەر / nawb(i)jîker/:** ☜ **ناوبژی ـ٢**

**ناوبژیکەری / nawb(i)jîkerî/:** ناو. هەجاسی؛ ناوجیگەری ☰ میانجیگری

**ناوبگێر / nawb(i)gêr/:** ناو. کار و ڕەوتی ناڤ برن؛ ناو بردن ☰ عمل نام بُردن

**ناوبوێر / nawb(i)wêr/:** ناو. نێوبوێر؛ دۆخی لە بیر چوون یان لە بیر کردنی ناوی کەسێ یا کەسانێ کە بە ناو بانگ دەکرێن ‹ناوی هەموانی گوت و ناوبوێری نەکرد›. هەروەها: **ناوبوێر کردن** ☰ عمل از قلم انداختن نام کسی یا کسانی

**ناوبەتاڵ / nawbetał/**: ناوەڵناو. بۆش؛ کاواک؛ کلۆر ☰ کاواک

**ناوبەشی / nawbeşî/**: ناو. ناوکۆیی؛ شەریکی ☰ شراکت

**ناوبەناو / nawbenaw/**: ناوەڵکار. ناوەناو؛ ناوناو؛ ناوناوە؛ ناوەناوە؛ نێوبەنێو؛ جارجارێ؛ دەمەدەمێ؛ گاگایێ ‹ناوبەناوێ دەرئەکەوێ و دەرناکەوێ «شێرکۆ»› ☰ گاهگاه

**ناوبەین / nawbeyn/**: ناو. مابەین؛ ماعبەین ☰ مابین

**ناوبینی / nawbînî/**: ناو. ئاندوسکۆپی؛ هەنابینی ☰ آندوسکُپی

**ناوپا / nawpa/**: ناو. *[شوورەیی]* دوڕ هەردوو ڕان؛ ناف گەڵ ☰ میان دو پا

**ناوپارە / nawpare/**: ناوەڵناو. لە نێو پڕایی دوڕی شار یان ئاواییدا هەڵکەوتوو ‹گەڕەکی قەتارچیانی سنە ناوپارەیە، هەموو دوکانێکی لێ نزیکە› ☰ در مرکز جمعیت و شلوغی شهر یا آبادی

**ناوپایی / nawpayî/**: ناو. *[وەرزش]* کاری ڕەت کردنی کەرەسەی یاری (وەک: تۆپ) لە نێوان هەردوو پێی هەڤبەرەوە ☰ لایی

**ناوپڕ[1] / nawpiř/**: ناو. ناواخنی دیوار. هەروەها: **ناوپڕ کردن** ☰ آگنەی دیوار

**ناوپڕ[2]**: ناوەڵناو. تۆکمە ‹ئێسکی ناوپڕ› ☰ توپر

**ناوپشتە / nawpişte/**: ناو. ڕەچەڵەک؛ ڕەگەز ☰ اصل؛ نسب

**ناوپەل / nawpel/**: ناو. ١. ناوەڕاستی دوو لکەدار ٢. ماوەی ناو دوو دەستی یەکسم ‹ناوپەلی فیلە، کۆشی عیفریتە/ چاوی مەرگی هەمیشە لێ زیتە/ ئاخ کە ئەم قەومە چەندە قوربەسەرە! «گۆران»› ☰ ١. وسط دو شاخه ٢. فاصلەی میان دو دست ستور

**ناوپەنجە / nawpence/**: ناو. قولەمست؛ ناولەپ ☰ کف دست

**ناوپەنچک / nawpençik/**: ناو. دیافراگم؛ پەردەی ماسوولکەیی نێوان سینگ و سک کە لە هەناسەداندا دەورێکی گرنگ دەگێڕێ ☰ دیافراگم

**ناوتا / nawta/**: ☜ نێوبار

**ناوتاق / nawtaq/**: ناو. ١. قەمامەیێ کە ئەخرێتە قلفی جەوالەوە بۆ بار کردنی دوو تا جەوال ٢. سەرتاقەی دیوار ☰ ١. بند حلقەی کنارەی جوال ٢. میان تاقچە

**ناوتان / nawtan/**: ناو. تیغەی لە شووڵ تەنراو بۆ ژووری ماڵ ☰ تیغەی ترکەیی

**ناوتش / nawtiş/**: چاوگ. شاندان؛ ڕانان؛ خستنە بەر چاو ☰ نشان دادن؛ به نمایش گُذاشتن

**ناوتوێڵ / nawt(i)wêł/**: ناو. ١. توێڵ؛ ئەنی ٢. کاری خاڵ کوتان لە توێڵی منال ☰ ١. پیشانی ٢. خالکوبی بر پیشانی بچه

**ناوتەنگ / nawteng/**: ناو. تەنگە؛ تەنگەلان؛ قوڕنووش ☰ تنگه

**ناوتێلانە / nawtêłane/**: ناو. جەهاز؛ جیازی بووک ☰ جهیزیەی عروس

**ناوجەرگە / nawcerge/**: ناو. نێوجەرگە؛ مەیان؛ دوڕ ☰ وسط

**ناوجەژنان / nawcejnan/**: ☜ نێوجێژنان

**ناوجەغز / nawceğz/**: ناو. دوڕی گۆز ☰ وسط دایره

**ناوجی / nawcî/**: ☜ ناوبژی

**ناوجیکار / nawcîkar/**: ☜ ناوبژی ـ٢

**ناوجیکەر / nawcîker/**: ☜ ناوبژی ـ٢

**ناوجیگەری / nawcîgerî/**: ناو. ☜ ناوبژی ـ١

**ناوجێ / nawcê/**: ☜ ناوبژی

**ناوجێژنان / nawcêjnan/**: ☜ نێوجێژنان

**ناوجێکەر / nawcêker/**: ناو. ناوبژی؛ ناوبژیکەر ☰ میانجی

**ناوچاو / nawçaw/**: ناو. ١. توێڵ؛ ئەنی؛ ناوتوێڵ

٢. *[مەجاز]* بەخت ‹جا ئەگەر ناوچاو نەیهێنێ، بلەی چی؟!› ☰ ١. پیشانی ٢. شانس

⊡ **ناوچاو ترشانن:** *[مەجاز]* تورشاندن؛ ڕوو گرژ کردن ☰ اخم کردن

**ناوچاو هێنان:** *[مەجاز]* بەخت یار بوون؛ شانس هەبوون ☰ بخت یار بودن

**ناوچاوان** / nawçawan/: ☜ **نێوچاوان**

**ناوچاوان پاک** / nawçawanpak/: ☜ **نێوچاوان پاک**

**ناوچاوان ترش** / nawçawantirş/: ☜ **نێوچاوان گرژ**

**ناوچاو پاک** / nawçawpak/: ☜ **نێوچاوان پاک**

**ناوچاوتاڵ** / nawçawtał/: ناوەڵناو. گرژ؛ نەمرچ ☰ عبوس

**ناوچاوتاڵی** / nawçawtałî/: ناو. پۆق؛ گرژی ☰ اَخم

**ناوچاوترش** / nawçaw tirş/: ☜ **نێوچاوان گرژ**

**ناوچاوترشاو** / nawçaw tirşaw/: ☜ **نێوچاوان گرژ**

**ناوچاوترشیاگ** / nawçawtirşyag/: ☜ **نێوچاوان گرژ**

**ناوچاوچەرمگ** / nawçaw çermig/: ناوەڵناو. مارۆ ☰ پیشانی سفید

**ناوچاودێز** / nawçawdêz/: ☜ **نێوچاوان گرژ**

**ناوچاوڕۆشن** / nawçaw řoşin/: ☜ **نێوچاوان پاک**

**ناوچاوگرژ** / nawçaw girj/: ☜ **نێوچاوان گرژ**

**ناوچۆمان** / nawçoman/: ☜ **نێوچۆمان**

**ناوچە** / nawçe/: ناو. ١. ناقچە؛ مەڵبەند؛ ناو؛ ناوان؛ ناوەقە ٢. گەرووڵەی ئاش ☰ ١. ناحیە؛ منطقە ٢. گلوی آسیا کە گندم از آن ریزد

**ناوچەدار** / nawçedar/: ناو. شارۆچکەوان ☰ بخشدار

**ناوچەوان** / nawçewan/: ☜ **نێوچاوان**

⊡ **ناوچەوان بە یەکا دان:** تورشاندن؛ ڕوو گرژ کردن ☰ اخم کردن

**ناوچەوان پاک** / nawçewanpak/: ☜ **نێوچاوان پاک**

**ناوچەوان ترش** / nawçewantirş/: ☜ **نێوچاوان گرژ**

**ناوچەوان ڕوون** / nawçewanřûn/: ☜ **نێوچاوان پاک**

**ناوچەوان قۆقز** / nawçewan qoqiz/: ناوەڵناو. ١. ئەنی زەق ٢. *[مەجاز]* کلۆڵ و چارەڕەش ☰ ١. پیشانی برآمده ٢. سق سیاه

**ناوچەوان قەشقە** / nawçewan qeşqe/: ناوەڵناو. *[مەجاز]* بەدبەخت و چارەڕەش ☰ سق سیاه

**ناوچەوان گرژ** / nawçewan girj/: ☜ **نێوچاوان گرژ**

**ناوچیا** / nawç(i)ya/: ناو. ناوچەیێ کە لە مابەینی کێواندا بێ ☰ کوهسار

**ناوچین** / nawçîn/: ناو. قوڕ و خشتی ئاخندراوی چینی دیوار ☰ آگنەی دیوار

⊡ **ناوچین کردن:** گەڵای قەدی تووتن کردنەوە ☰ کار چیدن برگ‌های میانی توتون

**ناوخاڵی** / nawxałî/: ناوەڵناو. ناوبەتاڵ؛ واڵا؛ پووچ ☰ میان تُهی

**ناوخوا** / nawx(i)wa/: ☜ **نامەخوا**

**ناوخوان** / nawx(i)wan/: ناو. قووڵایی زین؛ خوانی زین ☰ گودی زین

**ناوخوڕ** / nawxuř/: ناو. پلووسک؛ پلوور ☰ ناودان

**ناوخوین** / nawx(i)wîn/: ناو. دۆخین؛ بەن دۆخین ☰ بند تُنبان

**ناوخۆ**[١] / nawxo/: ناو. نێوخۆ؛ نێوانی خۆ ‹هەندیک لە ناوخۆدا خەریکی ئاژاوە نانەوەن› ☰ داخل

**ناوخۆ**[٢]: ناوەڵناو. ناوخۆیی؛ نێوخۆ؛ پێوەندیدار بە نێوانی دوو یا چەن لایەنەوە ‹شەڕی ناوخۆ؛ کاروباری ناوخۆ› ☰ داخلی؛ درونی

**ناوخۆیی** / nawxoyî/: ☜ **ناوخۆ**[٢]

**ناودار** / nawdar/: ناوەڵناو. ١. پڕ؛ نزن؛ تژی ٢. بەکاکڵ؛ پێچەوانەی پووچەڵ ٣. بەناوبانگ؛ خاوەن‌ناو ٤. ناولێنراو ☰ ١. پُر ٢. مغزدار ٣. نامدار ۴. دارای نام

**ناودۆک** / nawdok/: ☜ **ناونێرک**

**ناودەس** / nawdes/: ☜ **ناودەست**

**ناودەست** / nawdest/: ناو. ناودەس؛ نێودەست: ١. مەودای نێوان دوو دەستی ئەسپ ٢. لەپ؛ بەری دەست ⊡ ١. فاصلەی بین دو دست اسب ٢. کف دست

**ناودەشت** / nawdeşt/: ناو. ناڤدەشت؛ دەشتایی لە ناو کێواندا ⊡ دشت محصور در کوهستان

**ناودەڵ** / nawdeł/: ناو. عەبدال؛ عەبدال؛ نێرەپۆڕ ⊡ دُرّاج نر

**ناودەڵان** / nawdełan/: ناو. دەڵان؛ دەڵانە؛ پلەی پەیژە ⊡ پلەی نردبام

**ناودێر**[١] / nawdêr/: ناو. ناڤدێر؛ ناڤدایی؛ ناولەسەر؛ دیاریکراو بۆ کارێک ‹چوار ناودێر بۆ سەرۆکایەتی هەڵبژێران› ⊡ نامزد

**ناودێر**[٢]: ئاوەڵناو. ١. ناونراو ‹ئەم ڕۆژە بە ناوی ڕۆژی پێشمەرگە ناودێر کراوە› ٢. ☜ **نێودار** ⊡ ١. نامیده شده ٢. ☜ **نێودار**

**ناوران** / nawran/: چاوگ. ناورانەوە؛ لالانەوە؛ پاڕانەوە ⊡ لابه کردن

**ناورانەوە** / nawranewe/: ☜ **ناوران**

**ناورتە** / nawirte/: ئاوەڵناو. ناڕێک؛ تێکەڵوپێکەڵ ⊡ نامُرتب

**ناوڕاس** / nawřas/: ☜ **ناوەڕاست**

**ناوڕاسگ** / nawřasig/: ☜ **ناوەڕاست**

**ناوڕان** / nawřan/: ناو. ١. گەڵ؛ دوڕ هەردوو ڕان ٢. ناو کەرگەپەز ‹ئەو سۆنە ڕەوتە ڕابورد لە مانگی تابان ئەچێ/ موژدە بە عاشقانە ڕەعنا بۆ ناوڕان ئەچێ «مەلا سادق نگلی»› ⊡ ١. میان هر دو ران ٢. میانِ گله

**ناوڕوان** / nawř(i)wan/: ناو. ١. مابەینی دوو چۆمان ٢. بەینچۆمان؛ نێوان دوو ڕووباری دیجلە و فورات ⊡ ١. میان دو رود ٢. بین‌النهرین

**ناوزڕاو** / nawz(i)řaw/: ئاوەڵناو. ناوزڕیاگ؛ ئابڕووونەماو؛ ڕووسیا ⊡ رسوا

**ناوزڕاوی** / nawz(i)řawî/: ناو. بێئابڕوویی؛ ئابڕووتکاوی ⊡ رسوایی؛ بدنامی

**ناوزڕیاگ** / nawziřyag/: ☜ **ناوزڕاو**

**ناوزگ** / nawzig/: ناو. ناوسک: ١. هەرچی لە دوڕ سکدایە ٢. بەز و چەوراییی ناوسک ⊡ ١. احشاء ٢. چربی و پیه درون شکم

**ناوزێلە** / nawzêle/: ☜ **ناوەزیلە**

**ناوساجی** / nawsacî/: ناو. نانساجی؛ زرووبی ⊡ نوعی گرده در روغن سرخ شده

**ناوسار** / nawsar/: ناو. سەرنیای ئاسیاو ⊡ جوی سر ناو آسیاب

**ناوسک** / nawsik/: ☜ **ناوزگ**

**ناوسنگانە** / nawsingane/: ناو. تاوە؛ قەلینەک؛ ماوڕێژ ⊡ تابه

**ناوسێڵ** / nawsêł/: ناو. ناوسێڵی: ١. ناوساجی؛ زرووبی ٢. قوڕاو؛ بەربەسێل ⊡ ١. نوعی گرده در روغن سرخ شده ٢. خورشتِ گوشت و ماست

**ناوسێڵی** / nawsêłî/: ☜ **ناوسێڵ**

**ناوشاخ** / nawşax/: ناو. ١. ناوچیا؛ مەڵبەندێ لە ناو کێواندا ٢. مابەینی دووشاخی حەیوان ٣. مۆخی ناو شاخی حەیوان ⊡ ١. کوهسار ٢. میان دو شاخ حیوان ٣. مغز شاخ حیوان

**ناوشار** / nawşar/: ناو. ١. ناو باژێڕ ٢. ناوەندی باژێڕ ⊡ ١. داخل شهر ٢. مرکز شهر

**ناوشان** / nawşan/: ناو. ناڤشان؛ ناڤقۆڵنج؛ قەلاندۆش؛ ناوملان؛ مابەینی دوو شانی مرۆ ⊡ دوش؛ میان شانه

**ناوشانپان** / nawşanpan/: ئاوەڵناو. کەڵەگەت؛ شان و ملقەوی ⊡ کت‌وکلفت؛ هیکلی

**ناوفلیقان** / nawf(i)lîqan/: ناو. ناو پەلی دار ⊡ میان شاخه‌ها

**ناوفەرش** / nawferş/: ناو. ١. مافووری زیاتر گچکە، کە لە ناوەڕاس ڕادەخرێ ٢. پارچە

چەرمێ کە دەخرێتە ناو کەوش 🇮🇷 ١. فرش وسط اتاق ٢. کفه؛ کفی کفش

**ناوقەد / nawqed/**: ناو. ناڤقەد؛ ناوقەو: ١. کەمبەر؛ ناوڕاسی بەژن ‹ناوقەد باریک› ٢. ناوڕاسی کێو ‹ناوقەدی کێوەکەی بڕی و بە یالەکەدا سەر کەوت› ٣. ناوڕاسی قەدی دار 🇮🇷 ١. کمر ٢. کمر کوه ٣. وسط تنەی درخت

**ناوقەدباریک / nawqedbarîk/**: ئاوەڵناو. بەژنباریک؛ بەژنزراڤ؛ بەژنزراو 🇮🇷 کمرباریک

**ناوک / naw(i)k/**: ناو. نێوک؛ ناڤ؛ نیڤک؛ ناکە: ١. گرتگ؛ نەهە؛ شوێنی بڕانی بەندی ناوک کە وەک قوولکەیەکی بچووکی لێوار زۆپ لە ناوەڕاستی زکدا دیارە ٢. ناوکە؛ دەنکی میوە ٣. ☜ ناوکە ـ١ 🇮🇷 ١. ناف ٢. هسته ٣. ☜ ناوکە ـ١

▣ **ناوک بڕین**: ١. بڕین و لابردنی ناوکی منداڵ لە کاتی هاتنە دنیادا ٢. *[مەجاز]* کۆتایی پێ هێنان و تەواو کردنی کار. هەروەها: **ناوکبڕان** 🇮🇷 ١. ناف بریدن ٢. تمام کردن کار

**ناوک کەوتن/ کەفتن**: ١. جێ‌بەجێ بوونی ماسوولکەکانی سەر ناوک بە هۆی هەڵگرتنی شتی قورس یان ڕاچڵەکانەوە ٢. *[کینایە]* زۆر ترسان 🇮🇷 ١. ناف افتادن ٢. زهرەترک شدن

**ناوک گرتنەوە**: ١. چارە کردنی ناوک کەوتن ٢. *[کینایە]* ئازار دانی زۆر ٣. *[کینایە]* پارەیەکی زۆر پێ خەرج کردن 🇮🇷 ١. معالجه کردن ناف افتادن ٢. بسیار آزار رساندن ٣. خرج حسابی روی دست گذاشتن

**ناوک نەکەفتن**: *[پلار]* تانە و تەشەر لێدان لە بەر نەتوانینی ئەنجام دانی کارێ بەتایبەت وەکوو هەڵگرتنی شتی قورس ‹هۆشت بێ ناوکت نەکەفێ چوار دانە نانت سەندگە!› 🇮🇷 بیمار نشدن

**ناوک هاتنەوە**: چار کردنی ناوک کەوتوو 🇮🇷 جا افتادن ناف افتاده

**ناوک هێنانەوە**: ناوک گرتنەوە 🇮🇷 جا انداختن ناف افتاده

**ناوکار / nawkar/**: ناو. ١. ناوچینی دیوار ٢. تەریب؛ تەقەڵی درشتی بە زنجیرە ٣. *[وێژەیی]* وشەی زیادی لە شیعردا بۆ پڕ کردنەوەی کێش (وەکوو وشەی «چاوەکەم» لەم بەیتەدا: دەردی دووری زۆر گرانە دلبەرا هیجران بەسە!/ دڵ وەکوو پەروانە سووتا، چاوەکەم سووتان بەسە «حەقیقی») 🇮🇷 ١. آگنەی دیوار ٢. بخیەهای درشت و زنجیرەای در لحاف ٣. حشو شعری

**ناوکبڕ / naw(i)kbiř/**: ناو. کەسێ کە ناوکی زارۆ دەبڕێ 🇮🇷 نافبُر

**ناوکۆ[1] / nawko/**: ناو. ١. دوڕ خەرمانی سوور ٢. نێوبار؛ ناڤبار؛ سەربار ٣. دوڕ خەڵک و جەماوەر 🇮🇷 ١. وسط تودەی خرمن ٢. اضافه بار ٣. وسط تودەی مردم

**ناوکۆ[2]**: ئاوەڵناو. بەشنەکراو 🇮🇷 مُشاع

**ناوکۆمەڵ / nawkomeł/**: ناو. پسات؛ جوات؛ جەرگەی حەشامات 🇮🇷 اجتماع

**ناوکۆیی / nawkoyî/**: ناو. ناوبەشی؛ شەریکی 🇮🇷 شراکت

**ناوکە / nawke/**: ناو. ١. *[باوەڕی خەڵک]* بەردێکە گیای لێ دەئاڵێنن گەنمی خەرمانی بە سەردا دەبێژن بۆ بەرەکەت ٢. دەنکی گوڵەبەڕۆژە و کدوو ٣. ☜ **نێوک ـ١**. هەروەها: **ناوکە تووکاندن؛ ناوکە شکاندن؛ ناوکە تەقاندن** 🇮🇷 ١. سنگی کە بە نیت تبرک در گیاه پیچند و زیر خرمن گذارند ٢. تخمه ٣. ☜ **نێوک ـ١**

**ناوکەبڕ / nawkebiř/**: ناو. *[دابی کۆن]* ناوکەبڕە؛ کچێ کە ڕۆژی لە دایک بوونی (ناوک بڕانی) بۆ کوڕێک دیاری کراوە 🇮🇷 دختری کە نافش را بە نام پسری بُریدەاند

**ناوکەبڕە / nawkeb(i)ře/**: ☜ **ناوکەبڕ**

**ناوکەپەمۆ** / nawkepemo/: ناو. پەمۆدانە؛ پەمبۆدانە 🇮🇷 پنبەدانە

**ناوکەخۆشە**[١] / nawkexoşe/: ناو. دەنکە قەیسی شیرین 🇮🇷 هستەی شیرین زردالو

**ناوکەخۆشە**[٢]: ئاوەڵناو. بە ناوکەی شیرینەوە (قەیسی) 🇮🇷 با هستەی شیرین (زردالو)

**ناوکەڕەشە** / nawkeřeşe/: ناو. ١. نەخۆشییەکی یەکسم ٢. ئافەتێکی تووره 🇮🇷 ١. از بیماری‌های ستور ٢. آفت تُرُب

**ناوکەڕێژ** / nawkeřêj/: ناو. ناوکەڕێش؛ ناوکەڕەشەی یەکسم 🇮🇷 از بیماری‌های ستور

**ناوکەڕێش** / nawkeřêş/: ☜ **ناوکەڕێژ**

**ناوکەن**[١] / nawken/: ناو. کاری کەندنی بەرە و ناوەوەی شوێنێ ‹ناوکەنی کە!› 🇮🇷 خَک

⊡ **ناوکەن کردن**: کەندنی باخ، بەتایبەت بەرەو قووڵایی و هەروەها نێوان کەرتەکانیش 🇮🇷 کندن عُمقی و سراسری باغ

**ناوکەن**[٢]: ئاوەڵناو. هەڵکەنراو؛ هەڵکۆشراو ‹سێ‌تاری ناوکەن› 🇮🇷 خَک شده

**ناوکێش** / nawkêş/: ناو. جۆگەی سەرەکی مەرەزە؛ شەقەجۆی مەرەزە 🇮🇷 جوی سراسری شالیزار

**ناوگ** / nawig/: ناو. ناونجی؛ نیڤی؛ مامناوەند 🇮🇷 میانه

**ناوگڵ** / nawgił/: ناو. [شووره‌یی] ناوگەڵ؛ ناڤکەل؛ ناوپا؛ گەڵ 🇮🇷 وسط ران‌ها

**ناوگۆڕک** / nawgořik/: ناو. نێوگۆڕک؛ ئاگردانی ناو دیوەخان و مزگەوت 🇮🇷 آتشدان مجلس

**ناوگەڕ** / nawgeř/: ناو. ١. مابەینی دوو زەمینی شێوەردبڕاو ٢. چزیرکەی چکۆلەی ناوەڕاستی چۆم ٣. دەشتایی لە نێوان چیایاندا 🇮🇷 ١. مرز میان دو شخم ٢. جزیرەی ماسه‌ای کوچک در میان رودخانه ٣. دشت محصور در کوهستان

**ناوگەڕە** / nawgeře/: ناو. ١. ناوگەڕ؛ مابەینی دوو زەمینی شێوەردبڕاو ٢. کاکڵ؛ ناوکەی بادام و ... 🇮🇷 ١. مرز میان دو شخم ٢. مغز بادام و ...

**ناوگەڵ** / nawgeł/: ناو. [شووره‌یی] ناوگڵ؛ نێوگەڵ؛ گەڵ 🇮🇷 میان دو ران

**ناوگیر** / nawgîr/: ئاوەڵناو. ناو لێ براو؛ ناو باس کراو 🇮🇷 نامبُرده

**ناوگین**[١] / nawgîn/: ناو. ١. مامناونج؛ مامناوەند ٢. ☜ **ناوەڕاست** 🇮🇷 ١. میانه ٢. ☜ **ناوەڕاست**

**ناوگین**[٢]: ئاوەڵناو. ناوەڕاستی؛ لە نێواندا جێگرتوو 🇮🇷 وسطی

**ناولقان** / nawl(i)qan/: ناو. ناولکان؛ دوڕ پەلی دار 🇮🇷 میان شاخەها

**ناولکان** / nawl(i)kan/: ☜ **ناولقان**

**ناولنگ** / nawling/: ناو. [شووره‌یی] ناوگەڵ 🇮🇷 میان پاها

**ناولنگان** / nawlingan/: ناو. ١. [شووره‌یی] ناوگەڵ؛ ناوپا ٢. ناوسنگانە؛ تاوە 🇮🇷 ١. میان ران‌ها ٢. تابه

**ناولەپ** / nawlep/: ناو. دوڕ دەست 🇮🇷 کف دست

**ناولەسەر** / nawleser/: ناو. دیاریکراو بۆ کارێکی باش 🇮🇷 کاندید؛ نامزد

**ناولەش** / nawleş/: ناو. بن کلێشە؛ هندروو؛ دەروون 🇮🇷 اندرون

**ناولێنراو** / nawlên(i)raw/: ☜ **ناودارـ٤**

**ناوماڵ** / nawmał/: ناو. ناوماڵە؛ نێوماڵ: ١. کەل‌وپەلی ماڵ ٢. ژووری گەورەی خێزان ٣. تەختایی سێ گۆشەی دەسماڵی ژنانە ٤. تەختایی زین ٥. [کینایه] دوڕ زێی مێوینە 🇮🇷 ١. اثاثیه ٢. اتاق بزرگ در خانه ٣. وسط روسری زنانه ۴. تخت زین ۵. میان شرمگاه زن

**ناوماڵە** / nawmałe/: ☜ **ناوماڵ**

**ناومشت** / nawmişt/: ناو. کەپ؛ بەری دەست 🇮🇷 کف دست

**ناوملان / nawm(i)lan/**: ناو. ناوشان؛ مابەینی دوو شانی مرۆ ☰ دوش؛ میان شانه

**ناوناو / nawnaw/**: ☜ **ناوبەناو**

**ناوناوە / nawnawe/**: ☜ **ناوبەناو**

**ناونج / nawinc/**: ناو. نێوانە؛ بەرئەنجام ☰ میانگین

**ناونجی[1] / nawincî/**: ئاوەڵناو. ناوەنجی: ١. ناوەڕاسی؛ ناوەڕاستی؛ ناڤگینی ‹مندالی ناونجی› ٢. مامناونجی؛ مامناوندی؛ بەینابەینی؛ بە ڕادەی ناوەڕاستەوە ‹قەبارەی ناونجی› ☰ ١. وسطی ٢. متوسط

**ناونجی[2] / nawincî/**: جێناو. ناوەنجی؛ ناوەڕاسین؛ ناوەڕاستین؛ ناڤگین؛ کەسێ یان شتێ کە کەوتۆتە ناوەڕاستەوە ‹ ناونجییەکە هی منە› ☰ وسطی

**ناونراو / nawn(i)raw/**: ئاوەڵناو. ناودێر ☰ نام نهاده شده

**ناونگ[1] / nawing/**: ئاوەڵناو. ناوەڕاستی ☰ وسطی

**ناونگ[2]**: جێناو. ناوەڕاسین ‹لە کوڕەکانی، ناونگەکەیان زۆر وریایە› ☰ وسطی

**ناونوچک / nawnûçik/**: ☜ **ناونیتکە**

**ناونوچگ / nawnûçig/**: ☜ **ناونیتکە**

**ناونوس / nawnûs/**: ناو. ١. سەرژمێر ٢. کەسێ کە سیایی ناوی خەڵک دەگرێ ☰ ١. آمارگیر ٢. مسئول ثبت نام

**ناونوسی / nawnûsî/**: ناو. ١. سەرژمێری ٢. کاری نووسینی ناو لە قوتابخانە و زانستگا و... ☰ ١. آمارگیری ٢. ثبت‌نام

**ناونیتکە / nawnîtke/**: ناو. ناونووچک؛ ناونووچگ؛ نێونرتکە؛ نێو و نرتکە؛ ناتۆرە؛ ناو و ناتۆرە؛ سەرناوی سووک و ناپەسند ☰ لقب تحقیرآمیز

⊡ **ناونیتکە پێوە/ لێ نان:** نرتکە لێ نان ‹ناونیتکەم پێوە دەنێ› ☰ لقب ساختن برای کسی

**ناونیرە / nawnîre/**: ناو. دوو قوتەکەی لە ناوەڕاستی نیردا بۆ قایش ڕاگرتن ☰ دو قطعه چوب وسط یوغ

**ناونیشان / nawnîşan/**: ناو. ناونیشانە؛ ناوونیشانە؛ ناوونیشان؛ نیشان‌وناو: ١. نیشانی؛ نوون؛ ئادرەس ‹ناونیشانی ماڵەکەیان گۆڕا› ٢. سەرناو؛ سەردێڕ؛ ناو یان دێڕێک بۆ ناساندنی کەس، نووسراوە یان شوێنێک ‹وتارێک بە ناونیشانی «*پاراستنی ئازادی*» لە چاپ درا› ٣. *[کینایە]* قەدر و ڕێز لە ناو خەڵکا ‹بۆ خۆی ناونیشانێکی لە شاردا هەیە› ☰ ١. نشانی ٢. اسم و رسم در میان مردم

**ناونیشانە / naw nîşane/**: ☜ **ناونیشان**

**ناونێرک / nawnêrik/**: ناو. ناودۆک؛ داری ناو هەر دوو لۆلەپ کە بە سەر مەشکەدا دێت ☰ چوب وسطی مشک

**ناونێرۆک / nawnêrok/**: ناو. ١. ناونێرک؛ ناودۆک ٢. ئاوخۆرەوەی دار ☰ ١. چوب وسطی مشک ٢. آبخورەی درخت

**ناووناتۆرە / naw û natore/**: ناو. ☜ **ناونیتکە**

**ناوونیشان / naw û nîşan/**: ☜ **ناونیشان**

**ناوونیشانە / naw û nîşane/**: ☜ **ناونیشان**

**ناووورده / naw û wirde/**: ناو. درووماني زۆر ورد ☰ دوخت بخیەی ریز

**ناوۆ / nawo/**: ☜ **نوێ**

**ناوە / nawe/**: ناو. ١. دەفری قوڕ کێشان ٢. جۆرێ برنج ٣. چرچ و لۆچی لیباس ٤. ناوچە؛ مەڵبەند ٥. کەفەی ناو کەوش ٦. ناوەرە؛ خەتی نێوان دوو زەوی ☰ ١. ناوەی گِل‌کشی ٢. نوعی برنج ٣. چین و چروک لباس ۴. ناحیه؛ منطقه ۵. کفەی کفش ۶ مرز زمین کشاورزی

⊡ **ناوە دان:** ناوە کێشان؛ دیاری کردنی مەرزی زەوی ☰ کشیدن مرز میان دو قطعه زمین

**ناوە کێشان:** ١. بە ناوە قوڕ کێشانە سەربان ٢. ☜ **ناوە دان** ☰ ١. با ناوە گِل‌کشیدن ٢. ☜

**ناوە دان**

**ناوەبـەرە / nawebere/**: نـاو. ۱. ئامرازێکـە لـە ئەسپابی جووتدا ۲. دەستەکی تامان 🇮🇷 ۱. ابزاری در خیش ۲. چوب تکیەگاه دیوار ترکەای

**ناوەجاخ / nawecax/**: ☜ **ناوەجاغ**

**ناوەجاغ / nawecağ/**: ئاوەڵناو. ناوەجاخ؛ نارەسەن 🇮🇷 نانجیب

**ناوەخت / nawext/**: ئاوەڵناو. نابەوەخت؛ بێوەخت ‹میوانی ناوەخت گلەیی لە سەر خۆی!› 🇮🇷 نابهنگام

**ناوەرژن / nawerjin/**: ناو. پێخۆر؛ ئەوێ بـە نانـەوە دەخورێ 🇮🇷 نانخورش

**نـاوەرۆک / nawerok/**: نـاو. ناڤـەرۆک؛ ناوەرۆکـە؛ ناوەڕۆک: ۱. پێرس؛ پێرست ۲. ئـەوەی لـە نـاو شتێکدایە ‹ناوەرۆکی کتێب؛ نـاوەرۆکی پـرۆژە› ۳. کاکڵە؛ پوختە ‹قسەی بێناوەرۆک› 🇮🇷 ۱. فهرست ۲و۳. مُحتوا

**ناوەرۆکە / naweroke/**: ☜ **ناوەرۆك**

**نـاوەرە / nawere/**: نـاو. ۱. کەوشـەن؛ سـنووری کێڵگە ۲. باوەڕ 🇮🇷 ۱. مرز ۲. باور

**ناوەڕاس / naweřas/**: ☜ **ناوەڕاست**

**نـاوەڕاست[1] / naweřast/**: نـاو. نـاوەڕاس؛ ناڤـگین؛ ناوڕاسگ؛ ناوگین؛ ناوڕاس؛ نێوەڕاس؛ نێوەڕاسـت ‹ناوەڕاستـی حەوشەکە چاڵ بووە› 🇮🇷 وسط

**ناوەڕاست[2]**: ئاوەڵکار. ناوەڕاس؛ ناڤـگین؛ ناوڕاسـگ؛ نـاوگین؛ نـاوڕاس؛ نێـوەڕاس؛ نێوەڕاسـت؛ لـە ناوەڕاست ‹بچۆ ناوەڕاست› 🇮🇷 وسط

**نـاوەڕاسـتی / naweřastî/**: ئـامراز. ناڤـگین؛ نێوەڕاسـتی؛ ناوەڕاسـی ‹ناوەڕاسـتی دیکـەمان کانییەکی چاکی تێدایە› 🇮🇷 وسطِ

**ناوەڕاسگین / naweřasgîn/**: ☜ **ناوەڕاسین**

**نـاوەڕاسین / naweřasîn/**: ئاوەڵناو. ناوەڕاسـگین؛ نێوەڕاستی 🇮🇷 وسطی

**ناوەڕۆک / naweřok/**: ☜ **ناوەرۆك**

**ناوەڕێ / naweřê/**: ناو. ڕاداری؛ ڕێگری؛ بـاجگری 🇮🇷 راهزنی

**ناوەزۆڵ / nawezoł/**: ☜ **ناوەزیلە**

**ناوەزیلـە / nawezîle/**: نـاو. ناوەزێلـە؛ ناوزێلـە؛ ناوەزۆڵ؛ ناوەڕاست و گـوڵی هەرشتێ ‹ناوەزیلـەی شووتی› 🇮🇷 مغز و گُل هرچیز

**ناوەزێلە / nawezêle/**: ☜ **ناوەزیلە**

**ناوەژیـە / nawej(i)ye/**: ناو. کاژەنگ؛ بژار؛ وژن 🇮🇷 وجین

**ناوەسار / nawesar/**: ناو. سەرناوی ئـاش 🇮🇷 جـوی بالای ناو آسیا

**ناوەسـەر / naweser/**: نـاو. ناوەسـەرە؛ لفکـەی دەسماڵی ژنان 🇮🇷 دنبالەی سرپوش زنانه

**ناوەسەرە / nawesere/**: ☜ **ناوەسەر**

**نـاوەش / naweş/**: ئاوەڵـناو. ئـازاردەر؛ نـاخۆش 🇮🇷 ناگوار

**ناوەشـکێنە / naweş(i)kêne/**: نـاو. ئوتـوو؛ تـووز؛ چرچلابەر؛ جلسافکەر؛ دەقاق؛ کەرەسـەیەکە بـە پەڕەیەکی ساف و کانزاییەوە کـە داخ دەبـێ، بـۆ لابردنی چرچ و لۆچی قوماش 🇮🇷 اتو

**ناوەقە / naweqe/**: ☜ **ناوچە ـ۱**

**ناوەکرتە / nawekirte/**: ناو. نەخۆشییەکی ئاژەڵـە 🇮🇷 از بیماری‌های دام

**ناوەکی / nawekî/**: ئاوەڵـناو. ناوخۆ؛ نێوخۆ؛ نـاوینی 🇮🇷 داخلی

**ناوەکێش / nawekêş/**: ناو. کەسێ حەڕی بـە نـاوە دەکێشێ 🇮🇷 ناوەکش

**ناوەڵ / naweł/**: ناو. کەویژەی ئاش 🇮🇷 ناوەی آسیا

**ناوەن / nawen/**: نـاو. ڕفێدەی نانکـەر 🇮🇷 بالشـتک نانوا

**ناوەناو / nawenaw/**: ☜ **ناوبەناو**

**ناوەناوە / nawenawe/**: ☜ **ناوبەناو**

**ناوەنجی / nawencî/**: ☜ **ناونجی**

**ناوەنـد / nawend/**: نـاو. ناڤـەند؛ نیوەنـد: ١. ناوەڕاستی هەر شتێ ٢. سەنتەر؛ کۆگای چالاکی ☰ ١. مرکز؛ وسط ٢. مرکز فعالیت

**نـاوەنـدخوازی / nawendx(i)wazî/**: نـاو. ناوەندوازی؛ سەنتەرالیزم ☰ سانترالیسم

**ناوەندوازی / nawendwazî/**: ☜ ناوەندخوازی

**ناوەندی / nawendî/**: ئاوەڵناو. ناوەنگی: ناوین: ١. پێوەندیدار یان هاوگەری ناوەند ‹حوکمەتی ناوەندی› ٢. لە نێوەڕاستدا ‹خالی ناوەندی› ☰ ١و٢. مرکزی

**ناوەندیار / nawendyar/**: ☜ ناوبژی ـ٢

**ناوەندیەتی / nawed(i)yetî/**: ☜ ناوەندیتی ـ١

**ناوەندیتی / nawendêtî/**: نـاو. ١. ناوەندیەتی؛ ناوانی؛ مۆنەیی؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی ناوەند بوون ٢. میانەڕۆیی؛ بارودۆخی میانەڕۆ بوون ☰ ١. مرکزیت ٢. میانەروی

**ناوەنگی / nawengî/**: ☜ ناوەندی

**نـاوەنی / nawenî/**: ئاوەڵناو. تکاکـار؛ تکاکـەر؛ بەرەوان ☰ شفیع

**ناوەوان / nawewan/**: ناو. گەمیوان؛ گەمیەوان ☰ ناخدا

**ناوەوە / nawewe/**: ناو. ناو؛ دیوی ناوی هەر شتێ ☰ داخل

**نـاوەی / nawey/**: چـاوگ. سـاوین؛ سـایین ☰ اندودن؛ مالیدن

**ناویای / nawyay/**: چاوگ. هەنوان؛ سواغ دان ☰ اندوده شدن

**ناویاییش / nawyayîş/**: چاوگ. ناوتش؛ ڕانان؛ بەر چاو دان ☰ بە نمایش گذاشتن

**ناویژ / nawîj/**: ناو. خەربەندە؛ ئولاخدار؛ چاروادار ☰ چاروادار

**نـاویس / nawîs/**: نـاو. ١. وچخانـە؛ خەڵـوەتی ٢. ئۆدەی ژێرزەمین ☰ ١. انباری ٢. زیرزمین

**ناوین**[١] **/ nawîn/**: چاوگ. هەنوان؛ سواق/ سواغ/ سواخ دان ☰ اندودن

**ناوین**[٢]: ئاوەڵناو. ناڤین؛ ناوگین؛ لە ناوەڕاست و نێواندا ‹ڕۆژهەلاتی ناوین› ☰ میانی

**ناوینەوە / nawînewe/**: چاوگ. هەنوان؛ سواغ دان ☰ اندودن

**ناوینی / nawînî/**: ئاوەڵناو. ناوخۆ؛ نێوخۆ؛ ناوەکی ☰ داخلی

**ناوێر / nawêr/**: ناو. ناوپڕی دیوار ☰ آگنەی دیوار

**ناوێرە / nawêre/**: ئاوەڵناو. کەس‌نەدار؛ کەموێنە ☰ نادر

**ناوێزە**[١] **/ nawêze/**: ☜ ناوازە ـ١

**ناوێزە**[٢]: ☜ نەخوازە

**ناها / naha/**: ناو. شت؛ چت؛ چشت؛ تشت ☰ چیز؛ شیء

**ناهال / nahal/**: ئاوەڵناو. ١. ناحەساوی؛ ناڕاست ٢. توند و تیژ و کۆ نەکەرەوە ‹ئەم کوڕیانە یەکجار ناهالە!› ☰ ١. ناراست ٢. بی‌پروا

**ناهاڵ / nahał/**: ئاوەڵناو. ناهاڵا؛ توند و تیژ و کۆنەکەرەوە ☰ بی‌پروا

**ناهاڵا / nahła/**: ☜ ناهاڵ

**ناهتۆر / nahtor/**: ☜ ناتۆر

**ناهلیک / nahlîk/**: ☜ نالی

**ناهمێ / nah(i)mê/**: ☜ ناهومێد

**ناهومێ / nahumê/**: ☜ ناهومێد

**ناهومێد / nahumêd/**: ئاوەڵناو. نائومێد؛ ناهمێ؛ ناهومێ؛ دڵسارد؛ بە ئاوات نەگەیشتوو. هەروەها: **ناهومێدی** ☰ نااميد؛ نوميد

**ناهەق / naheq/**: ☜ ناحەق

**ناهەقی / naheqî/**: ☜ ناحەقی

**ناهەقیکار / naheqîkar/**: ☜ ناحەقیکار

**ناهەقیلێکراو / naheqîlêk(i)raw/**: ئاوەڵناو. دەشەنی؛ مەزڵووم ☰ مظلوم

**ناهەموار** / nahemwar/: ئاوەڵناو. ١. نارێک؛ بەرز و نـزم؛ بەکەندولەنـد ٢. /کنایە/ ناڵـەبار؛ نـاخۆش ‹ژیـانێکی ناهـەمواری هەیـە!› 🇮🇷 ١. نـاهموار ٢. نامُناسب

**ناهەنجار** / nahencar/: ئاوەڵناو. ناقۆڵا؛ ناپۆڕ؛ نەپۆڕ؛ نەگونجاو 🇮🇷 ناهنجار

**ناهی** / nahî/: نـاو. ١. ناهیـد؛ ئەستێرەگەشـە ٢. گیایەکە گوڵی ئەستێرە دەکا 🇮🇷 ١. ناهید؛ ستارەی سحری ٢. گیاهی است

**ناهید** / nahîd/: ☜ **ناهی ـ١**

**ناهیر** / nahîr/: ئاوەڵناو. نەفام؛ گەوج 🇮🇷 ابله

**نای** / nay/: ناو. بلوور؛ بلوێر؛ بلوول 🇮🇷 نی‌لبک

**نایاب** / nayab/: ئاوەڵـناو. نایـەب؛ نابـا؛ نابـە؛ زۆر بەبایەخ 🇮🇷 بسیار ارزنده

**نایب** / nayib/: ناو. بریکـار؛ کەسـێ کـە لـە بـاتی کەسێ‌تر کاروبار بەڕێوە دەبا 🇮🇷 نائب

**نایژە** / nayje/: نـاو. ١. کووژە؛ گەروولـەی ئاسـیاو ٢. جۆرێ بلوێر 🇮🇷 ١. گلوی آسیاب کـە گنـدم از آن ریزد ٢. نوعی نی‌لبک

**نایژەن** / nayjen/: ناو. نەیڤان؛ بلوێرژەن؛ بلوورژەن 🇮🇷 نی‌نواز

**نایسان** / naysan/: چاوگ. نایسین؛ هەڵ نـەبوون؛ گڕ نەگرتن 🇮🇷 مُشتعل نشدن

**نایسین** / naysîn/: ☜ **نایسان**

**نایلۆن** / naylon/: ناو. دەڵق 🇮🇷 نایلون

**نایە** / naye/: ناو. بلوێر 🇮🇷 نی‌لبک

**نایەب** / nayeb/: ☜ **نایاب**

**ناییش** / nayîş/: چـاوگ. دانـان؛ دانیـان (لـە سـەر زەوی) 🇮🇷 نهادن (بر زمین)

**نایینە** / nayîne/: جێناو. ١. ئەمانـە ٢. ئائەمانـە 🇮🇷 ١. این‌ها ٢. همین‌ها

**نایێ** / nayê/: ئاوەڵناو/ جێناو. ئەمە؛ ئائەمە 🇮🇷 همین

**نپنگ** / niping/: ئاوەڵـناو. نـەوی؛ نـزم 🇮🇷 پَسـت؛ کم‌ارتفاع

**نتر** / nitr/: ناو. ١. چاوەنۆڕی؛ چاوەڕوانی ٢. کاری گوڵ دروون لە قوماش 🇮🇷 ١. انتظار ٢. گُلدوزی

**نتراندن** / nitrandin/: چاوگ. ١. چاوەنۆڕی کردن ٢. نەخشـاندنی قومـاش بـە هـۆی دروون 🇮🇷 ١. انتظار کشیدن ٢. گلدوزی کردن

**نتل** / nitl/: ناو. نەخش 🇮🇷 نقش

**نتلاندن** / nitlandin/: چـاوگ. نتراندن؛ نەخشاندن 🇮🇷 نقشدار کردن

**نتم** / nitim/: ئاوەڵناو. مـتن؛ کـەم‌قسـە؛ کـەم‌دوو؛ بەرانبەری وڕاج 🇮🇷 کم‌حرف

**نـتم** / nitm/: نـاو. حەوسـەلە؛ سـەبر؛ پشـوو لەسەرخۆیی 🇮🇷 شکیبایی

**نجدە** / nicde/: ناو. قەمە 🇮🇷 قمّه

**نجمی** / nicmî/: ئاوەڵـناو. شـەل؛ لـەنگ؛ لـە پـا سەقەت 🇮🇷 لنگ

**نجومگەر** / nicûmger/: ناو. ئەستێرەناس 🇮🇷 منجم

**نچ**[1] / niç/: نـاو. سـووچی لێفـە و جلـک و ... 🇮🇷 گوشەی لباس و لحاف و ...

**نچ**[2]: دەنگەناو. ١. دەنگـی بـاریکی کرووزانـەوە ٢. پچـە؛ چپـە؛ سـرتە 🇮🇷 ١. نالـەی ضـعیف ٢. نجـوا؛ درگوشی

**نچار** / n(i)çar/: ئاوەڵناو. بێچارە؛ داماو؛ بەلەنگاز 🇮🇷 بیچارە؛ درماندە

**نچاندن** / n(i)çandin/: چاوگ. چزاندن؛ پێـوەدان 🇮🇷 گزیدن

**نچک** / niçik/: نـاو. ١. چۆنیـەتی ددان کـەوتن ٢. چلـۆپکی دار 🇮🇷 ١. چگـونگی افتـادن دنـدان ٢. بالاترین نقطەی درخت

**نچە**[1] / n(i)çe/: ئاوەڵناو. ١. سووکەڵە ٢. کەمووکـە 🇮🇷 ١. سُبک ٢. اندک

**نچە**[2]: دەنگەناو. نچ؛ دەنگـی کـزی نالـە 🇮🇷 صـدای ضعیف ناله

**نچه**[٢]: دەنگ. حەچە؛ وشەی دەنگ دانی کەر 🇮🇷 هین؛ حرف راندن الاغ

**نچەتا / n(i)çeta/**: ناو. تا و لەرزی سووک؛ سووکەلەتا 🇮🇷 تب سبُک

**نچەنچ / n(i)çeniç/**: دەنگەناو. ناڵەناڵی کورت و کز 🇮🇷 نانک‌ونال

**نچیر / niçîr/**: ☜ نێچیر

**نچیرڤان / n(i)çîrvan/**: ☜ نێچیرڤان

**نچیرکار / n(i)çîrkar/**: ☜ نێچیرڤان

**نچیروان / n(i)çîrwan/**: ☜ نێچیرڤان

**نخ / nix/**: ناو. دۆخی بە چۆکا هاتنی وشتر 🇮🇷 حالت بر زانو نشستن شتر

**نخافتن / n(i)xaftin/**: چاوگ. خۆ داپۆشین بە لێفە 🇮🇷 خود را با لحاف پوشانیدن

**نخاڤ / n(i)xav/**: ناو. نخێڤ؛ لێف؛ لحێف؛ لێفە؛ سەرەنداز 🇮🇷 لحاف

**نخان / n(i)xan/**: ☜ نینۆك

**نخاندن / n(i)xandin/**: چاوگ. گەرم داپۆشین (نەخۆشان) 🇮🇷 گرم پوشاندن (بیمار)

**نخاو / n(i)xaw/**: ☜ نۆکاو

**نخای / n(i)xay/**: ئاوەڵناو. بەدڕست؛ ڕەوشت‌خراپ 🇮🇷 بی‌ادب

**نختکاپەیەنێ / nixtikapeyenê/**: ناو. گیانەلاو؛ ڕەوتی ئاویلکەدان 🇮🇷 حالت نزع

**نختە / nixte/**: ناو. سەرەتای باران دادان 🇮🇷 شروع ریزش باران

**نخرۆ / nixro/**: ئاوەڵناو. ڕۆچوو؛ قوم‌بوو (لە ئاو یان زەلکاودا) 🇮🇷 غوطه‌ور (در آب یا باتلاق)

**نخری / nixrî/**: ☜ نخوری ـ١

**نخفتن / nixiftin/**: چاوگ. داپۆشین؛ وەشارتن 🇮🇷 پوشیدن؛ پنهان کردن

**نخوری / n(i)xurî/**: ناو. ١. نخری؛ ناخوری؛ نۆبەرە ٢. کاکە؛ برای گەورە 🇮🇷 ١. نوبر ٢. برادر بزرگتر

**نخوم / n(i)xum/**: ☜ نوخون

**نخوماندن / n(i)xumandin/**: چاوگ. نخوون کردن؛ بەراوەژوو کردن 🇮🇷 سرنگون کردن

**نخون / n (i)xun/**: ☜ نوخون

**نخۆ / n(i)xo/**: ☜ نۆك ـ١

**نخۆشەر / n(i)xoşer/**: ☜ نوخۆشەر

**نخوماندن / n(i)xûmandin/**: چاوگ. دیسان داپۆشین 🇮🇷 باز پوشیدن

**نخوون / n(i)xûn/**: ☜ نوخون

**ـ نخوونی / n(i)xûnî/**: پاشەوشە. ١. ـ نەخەوی؛ ـ نەخەفی (نە دی شەو و شەونخوونی/ نە چێشتی دەردی نەبوونی «هێمن») ٢. سەرەوخواری؛ سەرەولێژی 🇮🇷 ١. ـ نخوابی ٢. سراشیبی

**نخە / n(i)xe/**: ☜ نۆك ـ١

**نخەنخ / n(i)xenix/**: دەنگەناو. هەسکەهەسک؛ دەنگی هەناسەسواری 🇮🇷 هِن ـ هِن

**نخین / n(i)xîn/**: ناو. گوڵە شەللێرە 🇮🇷 لالەی سرنگون

**نخێڤ / n(i)xêv/**: ☜ نخاڤ

**نران / n(i)ran/**: چاوگ. تێپەڕ. نادیار. //نرای؛ دەنرێی؛ بنرێ// نریان؛ دانران 🇮🇷 نهاده شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: نراو/ چاوگی نەرێنی: نەنران

**نرت / nirt/**: لێل. ← نرت‌ونوێ

**نرتکە / nirtke/**: پێرۆ. ← نێوونرتکە

**نرت‌ونوێ / nirt û n(i)wê/**: ئاوەڵناو. نفت‌ونەو؛ تازەونوێ 🇮🇷 تازه و نو

**نرچ / nirç/**: ☜ نرکە

**نرچە / nirçe/**: ☜ نرکە

**نرخ / nirx/**: ناو. نەرخ؛ بایی؛ بەها؛ قیمەت 🇮🇷 نرخ

⊡ **نرخ برین**: نرخاندن؛ قەرساندن 🇮🇷 ارزیابی کردن

**نرخ دانان**: نەرخ دانان: ١. نرخاندن ٢. قەدر گرتن 🇮🇷 ١. ارزیابی کردن ٢. ارج گذاشتن

**نرخان / nirxan/**: چاوگ. قەبلان؛ قەبلین؛ قەولان

🇮🇷 ارزیابی شدن؛ برآورد شدن

**نرخاندن / nirxandin/**: چاوگ. بایەخ بۆ دانان ‹من ڕۆژگارێک شیعر و نامە دەسختەتییەکانی [سەید ڕەشیدی خانەقا]م کۆ دەکردەوە کە بە ڕاستی لە نرخاندن نایەن «هەژار، چێشتی مجێور»› 🇮🇷 ارزشیابی کردن

**نرخدار / nirxdar/**: ئاوەڵناو. بەقیمەت 🇮🇷 ارزشمند

**نرخنای / nirxnay/**: چاوگ. نرخ دانان 🇮🇷 ارزیابی کردن

**نرخە / nirxe/**: دەنگەناو. نرقە؛ لرچە؛ لرخە؛ دەنگ لە سنگەوە لە بەر تەنگەنەفەسی و نەخۆشی و ماندوویی 🇮🇷 خس ـ خس سینە

**نرخیای / nirxyay/**: چاوگ. نرخ دانران 🇮🇷 ارزیابی شدن

**نردۆک / nirdok/**: ناو. نێوبار؛ سەربار 🇮🇷 اضافەبار

**نردوو / nirdû/**: ناو. نوردوو؛ نوردی؛ نۆردو؛ نۆردوو؛ نۆردی؛ دەستە نانێکی پێکەوە پێچراو 🇮🇷 نوردە از چند نان

**نرڤان / nirvan/**: ناو. جمان؛ جمیان؛ جووڵیان 🇮🇷 جُنبیدن

**نرقە / nirqe/**: ☜ نرخە

**نرکاندن / nirkandin/**: چاوگ. نرکانن؛ دەنگی گڕ و بەقەو لە سنگەوە دەردان ‹هەموو هەر چاوەڕوانی هیمەتی تۆین/ بنرکێنی بە بارۆ و بیتە مەیدان «قانع»› 🇮🇷 هَی سر دادن

**نرکانن / nirkanin/**: ☜ نرکاندن

**نرکنو / nirkinû/**: ناو. تازە؛ نوێ؛ نەو 🇮🇷 تازە

**نرکونالە / nirk û nale/**: ☜ نکونالە

**نرکە / nirke/**: دەنگەناو. نرچ؛ نرچە؛ نەرچ؛ نەرچە؛ دەنگ لە سنگەوە لە ماندوویی 🇮🇷 صدای هِن ـ هِن

**نرکەنرک / nirkenirk/**: دەنگەناو. خوڕین؛ دەنگی هەناسەدانی ماندوو 🇮🇷 هِن ـ هِن

**نریان / niryan/**: ☜ نران

**نریای / niryay/**: چاوگ. نران؛ نریان 🇮🇷 نهادە شدن

**نریخانن / n(i)rîxandin/**: چاوگ. شەهین؛ حیلاندن؛ هێڕاندن 🇮🇷 شیهە کشیدن

**نریخە / n(i)rîxe/**: دەنگەناو. کوڕژنی ئەسپ؛ شیرە شیڕی ئەسپ 🇮🇷 شیهەی اسب

**نرناش / niřnaş/**: ناو. دێو؛ دێوەڵـووکە؛ عیفریت؛ جنۆکەی زەلامی شاخدار 🇮🇷 عفریت

**نرەنر / n(i)řeniř/**: دەنگەناو. حیلەحیلی ئێستر 🇮🇷 شیهەی استر

**نرین / n(i)řîn/**: چاوگ. حیلاندنی ئێستر 🇮🇷 شیهە کشیدن استر

**نز[1] / niz/**: ناو. ١. نەز؛ نەفەس؛ هەناسە ‹یەکجار نەخۆشە نزی لێ براوە› ٢. نم؛ تەڕایی؛ تەڕی ‹زەوی نزی لێ چنیاگە› 🇮🇷 ١. نفس ٢. رطوبت

**نز[2]**: ئاوەڵناو. نزم؛ بێئابڕوو؛ سووک لە بەر چاوان 🇮🇷 بی‌آبرو

**نزا / n(i)za/**: ناو. نقا؛ گازە؛ دۆعا؛ دوعا: ١. لاڤا؛ کاری ژارین؛ خوێندنی دۆعا ‹نە بە نیاز، نە بە نزا/ کۆمەڵت بەختیار ئەبێ «گۆران»› ٢. سکالا؛ دۆعایێ کە لە دەرگانەی خوا دەکرێ ‹نزام بۆ تۆیە ڕەببەلبەیت! دلم داخوازی ئیمدادە/ دەزانی عەبدی خۆت ئێستاکە وا بێتۆشە و زادە «ئاوات»› 🇮🇷 ١. دُعا ٢. نیایش

**نزاخوان / n(i)zax(i)wan/**: ☜ نزاخوێن

**نزاخوێن / n(i)zax(i)wên/**: ناو. نزاخوان؛ دوعاخوێن 🇮🇷 دُعاخوان

**نزار[1] / n(i)zar/**: ناو. ١. لێڕەوار؛ دارستان ‹تەپۆلکەی، یالی، دۆلی، نزاری/ گا شاش بوو، گا چڕ دەوەن و داری «گۆران»› ٢. ☜ نسار 🇮🇷 ١. جنگل ٢. ☜ نسار

**نزار[2]**: ئاوەڵناو. کز؛ لەڕ و لاواز 🇮🇷 لاغر

**نزارەوان / n(i)zarewan/**: ناو. کەسێ کە ئاگای لە لێڕەوارە 🇮🇷 جنگلبان

**نزاڕەوا / n(i)zařewa/:** ئاوەڵناو. تایبەتمەندی ئەوەی کە دۆعای قبووڵ دەبێ ☰ مُستجاب‌الدعوە

**نزاڤ / n(i)zav/:** ناو. نزاو: ١. زنە؛ جێگەی ئاودەڵێن و دایمە تەڕ ٢. ئاوی دەڵاو ☰ ١. جای همیشە مرطوب ٢. آبِ تراوش کردە

**نزان / n(i)zan/:** ناو. مژدە؛ خەبەری خۆش ☰ مُژدە

**نزاندن / n(i)zandin/:** چاوگ. ناڵاندن بە دەنگی نزم ☰ آهستە نالیدن

**نزانی / n(i)zanî/:** ناو. مزگێنی؛ مزگانی ☰ مُژدگانی

**نزاو[1] / n(i)zaw/:** ☜ نزاڤ

**نزاو[2]:** ئاوەڵناو. ١. ☜ نزیک ٢. ئاڵ و بۆڵ؛ ئاوتێزاو؛ ئاو تێگەڕاو (میوە) ☰ ١. ☜ نزیک ٢. آب گرفتە (میوە)

**نزبە / nizbe/:** ناو. ڕەزی دێمی تازە پێگەیشتوو ☰ تاکستان دیم تازە رسیدە

**نزدیک / nizdîk/:** ☜ نزیك

**نزدیکان / nizdîkan/:** ☜ نزیکان

**نزدیکی / nizdîkî/:** ☜ نزیکی

**نزر / nizr/:** ☜ نەزر

**نزرگ / nizirg/:** ☜ نزگەرە

**نزرگە / nizirge/:** ناو. ١. ☜ نەزەرگە ٢. ☜ نزگەرە

**نزرە / nizre/:** ☜ نزگەرە

**نزرێ / nizrê/:** ☜ نزگەرە

**نزگ / nizg/:** ناو. ١. نیوەهەناسە؛ هەناسەی کز و سەبرۆکە لە نەخۆشییەوە ٢. ژیان؛ ژی ☰ ١. نیم‌نفس ٢. زندگی

**نزگرە / nizg(i)re/:** ☜ نزگەرە

**نزگەرە / nizgere/:** ناو. نزرگ؛ نزرگە؛ نزگرە؛ نەزگرە؛ نسگەرە؛ نزگەرێ؛ نزرێ؛ نزیرە؛ نزرە؛ نزغەرە؛ نیزرێ؛ ئیسک؛ ئیسکە؛ عیسک؛ نسکە؛ هەسر؛ سهی؛ هەرس؛ بەرسنجک(سۆک)؛ بەرسینچکە؛ سیقە؛ ڕەوتی کرژ بوونەوەی کوت‌وپڕی پەردەی دیافراگم کە دەبێتە هۆی دەردانی هەناسە و بەسرانی گەلووت وێڕای دەنگێکی تایبەت ☰ سکسکە

**نزگەرێ / nizgerě/:** ☜ نزگەرە

**نزڵە / nizłe/:** ناو. نزوول؛ نوزڵە؛ نەزڵە؛ دۆخی هەلامەتی بەتەوژم کە هازەهاز لە سنگەوە دێت و ئاو لە لووت دەڕژێ ☰ سرماخوردگی شدید

**نزم / niz(i)m/:** ئاوەڵناو. نمز: ١. پێچەوانەی بڵند ‹دەنگی نزم؛ دیواری نزم› ٢. بێ‌تاقەت ٣. بێ‌ئاکار و کەم‌ئابڕوو ☰ ١. پست؛ کم‌ارتفاع ٢. ناتوان ٣. دون؛ بی آبرو

⊡ **نزم بوونەوە** داکەوتن؛ هاتنە خوار؛ نەوی بوونەوە ☰ پایین آمدن

**نزمان / nizman/:** ناو. نزمایی؛ شوێنی نزم ☰ پستی؛ جای کم‌ارتفاع

**نزمایی / nizmayî/:** ☜ نزمان

**نزم‌ونەوی[1] / nizm û newî/:** ئاوەڵناو. ١. کۆتا؛ بالا و بلندایی کەم ٢. *[کنایە]* فەقیرانە؛ بێ شکۆ و شانازی ‹لە ماڵێکی نزم‌ونەوی، ژیانێکی دژوار» ☰ ١. پست؛ کم‌ارتفاع ٢. فقیرانە

**نزم‌ونەوی[2]:** ئاوەڵکار. *[کنایە]* بە شێوەیەکی ئاسایی و بێ شکۆ و شانازی ‹وەرە وەک ئێمە بژی نزم‌ونەوی/ شەو لە سەر گەندەڵەداری دەخەوی! «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ معمولی

**نزمی / nizmî/:** ناو. ١. نەویایەتی ‹بەرزی و نزمی ژیان› ٢. بێ‌ئاکاری ‹زیاتر لە جاران ئەو نزمی و ناپیاوییەم بۆ دەرکەوت› ☰ ١. پستی؛ مُخالف بلندی ٢. پستی؛ رذالت

**نزوول / n(i)zûl/:** ناو. ١. سووتی پارە ٢. ☜ نزڵە ☰ ١. ربا؛ بهرەی پول ٢. ☜ نزلە

**نزوولە / n(i)zûle/:** ناو. نزوولە: ١. دۆعای

بێچارەی هەناسەسارد ٢. هەناسەی سارد ≡ ١. دُعای مُستمند ٢. آه سرد

⊡ **هاتنە نزولەی کەسێکەوە** کەل گرتن؛ گەیشتنە فریای کەسێ ‹ئەم بەفرە هاتە نزوولەمانەوە قڕ نەکەین لە بێئاوی!› ≡ به فریاد کسی رسیدن

**نزوڵە** / n(i)zûle/: ☜ **نزولە**

**نزە**[1] / n(i)ze/: ناو. شنە؛ سروە ≡ نسیم

**نزە**[2]: ئاوەڵناو. نز؛ بێئابڕوو؛ بێفەڕ ≡ پست‌فطرت

**نزەبا** / n(i)zeba/: ناو. سروە؛ شنەبا؛ شی با؛ کزەبا؛ بای بسکان ≡ نسیم

**نزیک**[1] / n(i)zîk/: ئاوەڵناو. نزاو؛ نزدیک؛ نزدیکان؛ نزینگ؛ نوزدی؛ نەدوور؛ نەدویر؛ نەزدیک؛ نەزیک؛ نیزک؛ نیزیک؛ نێز؛ نێزک؛ نێزگ؛ نێزنگ؛ نێزینک؛ نێزینگ؛ نهنگ؛ نەژدی؛ نێژدی: ١. بە مەودایەکی کەمەوە ‹ڕێگای نزیک› ٢. بە جیاوازییەکی کەمەوە ‹چەن ڕەنگی نزیک هەڵبژێرە!› ٣. نێوان‌خۆش ‹دۆستی نزیک› ≡ ١تا٣. نزدیک

⊡ **نزیک بون** ١. وەخت بوون؛ خەریک بوون ‹نزیک بوو بکەوم› ٢. ☜ **نزیک بونەوە** ≡ ١. نزدیک بودن ٢. ☜ **نزیک بونەوە**

**نزیک بونەوە** نزیک بوون؛ نزیک خستنەوە؛ نزیک کەوتن؛ دووری لە نێواندا نەمان ≡ نزدیک شدن

**نزیک خستنەوە** ١. ☜ **نزیک بونەوە** ٢. ☜ **نزیک کردنەوە**

**نزیک کردنەوە** نزدیک خستنەوە؛ کەم کردنەوەی مەودای نێوان دوو شت یان دوو کەس ≡ نزدیک کردن

**نزیک کەوتن** ☜ **نزیک بونەوە**

**نزیک کەوتنەوە** نزدیک بوونەوە؛ تخوون کەوتن ≡ نزدیکتر شدن

**نزیک**[2]: ئاوەڵکار. نزاو؛ نزدیک؛ نزدیکان؛ نزینگ؛ نوزدی؛ نەدوور؛ نەدویر؛ نەزدیک؛ نەزیک؛ نیزک؛ نیزیک؛ نێز؛ نێزک؛ نێزگ؛ نێزنگ؛ نێزینک؛ نێزینگ؛ نهنگ؛ نەژدی؛ نێژدی؛ بە مەودای کەمەوە ‹نزیک داینێ!› ≡ نزدیک

**نزیکان** / nizîkan/: ناو. نزدیکان: ١. نزیک؛ کات یان جێگای نزیک ‹ماڵمان لەو نزیکانە بوو› ٢. خزمان؛ خوێشان؛ خزم و کەسی نزیک ‹ماڵمان لەو نزیکانە بوو› ≡ ١. نزدیکی ٢. نزدیکان

**نزیکبین** / n(i)zîkbîn/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی چاوی تووش بە نەخۆشی نزیک‌بینی ≡ نزدیک‌بین

**نزیکبینی** / n(i)zîkbînî/: ناو. جۆرێک کەمایەسی لە بینایی چاودا کە نزیک چاک دەبینێ و دوور لێڵ ≡ نزدیک‌بینی

**نزیکی** / n(i)zîkî/: ناو. نێزیکی؛ نزدیکی: ١. دۆخ و چۆنیەتی نزیک بوون ‹نزیکی ڕێگا بوو بە هۆی ئەوە لێرە ماڵ بکڕم› ٢. کار و ڕەوتی دامەزراندنی پێوەندی ‹کاری هاوبەش بووە هۆی نزیکی پتریان› ٣. /کنایە/ هاوجێیی؛ پێوەندی جنسی ٤. شوێنی نزیک ‹لەو نزیکیە ماڵێک هەیە› ≡ ١تا٤. نزدیکی

⊡ **نزیکی کردن** /کنایە/ هاوجێیی کردن ≡ ارتباط جنسی برقرار کردن

**نزینگ** / n(i)zîng/: ☜ **نزیک**

**نزێرە** / n(i)zêre/: ☜ **نزگەرە**

**نژ** / nij/: ☜ **نشتەر**

**نژاد** / n(i)jad/: ناو. توخم؛ ڕەگەز ≡ نژاد

**نژار** / n(i)jar/: ناو. ١. سەنگ‌چن؛ کاری دیوار بە بەرد هەڵچنین ‹بیرەکەی نژار کرد، وەرەقە نەکا› ٢. جێگەی تەنیا و بێ‌هەرا ≡ ١. سنگچین ٢. جای دنج

**نژاندن** / n(i)jandin/: چاوگ. ١. دانانی دیوار لە وشکەبەرد ٢. بەستن؛ داخستن ≡ ١. بنا کردن دیوار از سنگ بدون ملاط ٢. بستن

**نژتەر** / nijter/: ☜ **نشتەر**

⊡ **نژتەر کرن:** خوێن بەردان؛ حەجامەت کردن ☰ حجامت کردن

**نژد** / nijd/: ناو. زام؛ برین؛ کوان ☰ زخم

**نژدار** / nijdar/: ☜ **نەشتەرگەر**

**نژداری** / nijdarî/: ☜ **نەشتەرگەری**

**نژدە** / nijde/: ناو. نژدی؛ نەژدە: ١. تەریدە؛ دەستەی ڕێگران ٢. تالانکەر ٣. ئەوانەی شوێن ڕێگران دەکەون بۆ کوشتن و گرتنیان ☰ ١. دستەی راهزنان ٢. غارتگر ٣. گروه دزدبگیران

**نژدی** / nijdî/: ناو. ١. ☜ **نەجدی** ٢. ☜ **نژدە**

**نژم** / nijm/: ناو. قەلافەت؛ بیچم ☰ ریخت و قیافه

**نژمشۆڕ** / nijmşoř/: ناوەلناو. مۆن؛ ڕووگرژ؛ ناوچاو تاڵ ☰ اخمو

**نژن**[1] / nijn/: ناو. وشکەچن؛ ئیشکەکەلەک ☰ سنگچین

**نژن**[2]: ناوەلناو. تژە؛ پڕ؛ دارماڵ ☰ پُر؛ مالامال

**نژناندن** / nijnandin/: چاوگ. پڕ و دارماڵ کردن ☰ مالامال کردن

**نژنی** / nijnî/: ناو. نژنیت؛ تەون؛ کار و ڕەوتی تەنین ☰ بافندگی

**نژنیت** / nijnît/: ☜ **نژنی**

**نژنین** / nijnîn/: چاوگ. ١. کاری بەرد لە سەر یەک چنین (بۆ سەنگچنی کۆلی پەز دەلێن) ٢. پڕ بوون ☰ ١. عمل سنگچین کردن آبشخور ٢. پُر شدن

**نژوە** / nijwe/: ناو. ١. کاری لەبەر گوتە نووسینەوە ٢. کاری لە ڕوو نووسینەوە ☰ ١. املاء ٢. رونویسی

**نژوو** / n(i)jû/: ناو. نیسک؛ نژی ☰ عدس

**نژی** / n(i)jî/: ☜ **نیسک**[1]

**نژیار** / nijyar/: ناو. خانووی وشکەچن ☰ خانەی سنگچین

⊡ **نژیار کردن:** ئاهەنگ و شایی گێڕان بە بۆنەی دەست پێ‌کردن یان تەواو بوونی کارێک ☰ سور گرفتن و شادی کردن به مناسبت شروع یا اتمام کاری

**نژیارڤان** / nijyarvan/: ناو. نژیاروان؛ ئاڤاهی‌ساز: ١. کەسێ کە گەلالەی خانووبەرە دەڕێژێ و بۆ کردنەوەی سەرپەرستی دەکا ٢. بیناساز؛ کەسێ کە بە ئەزموونی خۆی، ماڵ دەکاتەوە ☰ ١و٢. معمار

**نژیارڤانی** / nijyarvanî/: ناو. نژیاروانی؛ فەن یان هونەری گەلالەداڕژتن و کردنەوەی بینا، بەتایبەت ماڵ و خانووبەرە ☰ معماری

**نژیاروان** / nijyarwan/: ☜ **نژیارڤان**

**نژیاروانی** / nijyarwanî/: ☜ **نژیارڤانی**

**نسار** / n(i)sar/: ناو. نسرم؛ نزار: ١. بەر سێبەر؛ شوێنێ کە تاو نایگرێتەوە یا کەمتر دەیگرێ ٢. سێبەر؛ سێوەر ☰ ١. جای سایەسار ٢. سایه

**نسارە** / n(i)sare/: ناو. ١. نەخشی بە دارچین لە سەر فرنی ٢. کاری پووڵ هاویشتن بە سەر بووکا ☰ ١. نقش دارچین روی فرنی ٢. عمل پول بر سر عروس ریختن

**نستونوێ** / nist û niwě/: ☜ **نەوبنەو**

**نستەن** / nisten/: چاوگ. نستەنە؛ ڕۆنیشتن؛ نیشتن ☰ نشستن

**نستەنە** / nistene/: ☜ **نستەن**

**نسحەت** / nisĥet/: ناو. ئامۆژگاری؛ وەسیی؛ ئامۆژگاری ☰ نصیحت

**نسحەتکەر** / nisĥetker/: ناو. ئامۆژگار ☰ اندرزگو

**نسرم**[1] / n(i)sirm/: ☜ **نسار**

**نسرم**[2]: ناوەلناو. خۆرنەگیر و شێ‌دار و سارد ‹ئێرە نسرمە› ☰ سرد و نمور از بی‌آفتابی

**نسرین** / nisrîn/: ناو. ؛ کوڵی گریان و بەرەنسکێ؛ گریان و هەنیسک ☰ گریه و سکسکه

**نسف** / nisf/: ناو. نیوە ☰ نصف

**نسک**[1] / nisk/: ناو. ١. ☜ **نیسک**[1] ٢. ژیان ☰ ١.

☜ **نیسک**[١] ٢. زندگی

**نسک**[٢]: ئاوەڵناو. ١. فەقیر؛ بێ‌ماڵ ٢. چارەڕەش؛ داماو؛ هەناسەسارد ‹نسک و ناهمێ› ☰ ١. ندار؛ بینوا ٢. بیچاره

**نسکافە** / niskafe/: ناو. ناوی بازرگانی بۆ قاوەی ئامادە کە پێویستی بە کوڵان و دەم کێشان نییە ☰ نسکافه

**نسکاندن** / niskandin/: چاوگ. هەناسە دان ☰ نفس کشیدن

**نسکای** / niskay/: چاوگ. نسکین؛ نزگەرە کردن لە گریانەوە ☰ سکسکه کردن از گریه

**نسکنای** / nisknay/: چاوگ. نسکین؛ نزگەرە کردن لە گریانەوە ☰ سکسکه کردن از گریه

**نسکوناهمێ** / nisk û nah(i)mê/: ئاوەڵناو. نک‌وناهمێ؛ نک‌وناهومێ؛ بێچارە و خاکەسەر ☰ بیچاره؛ بدبخت

**نسکۆ** / nisko/: ناو. ڕەت؛ سەرسم؛ ڕەوتی هەڵەنگوتن بە هۆی پا هەڵکەوتن یان پاچەقول بوون ☰ سکندری

**نسکە** / niske/: ناو. بەرەنسکێ؛ نزگەرەی دوای گریانی زۆر ☰ سکسکه در اثر گریه‌ی زیاد

**نسکیان** / niskyan/: چاوگ. نسکین؛ بەرەنسکێ دان؛ نزگەرە کردن لە گریانەوە ☰ سکسکه کردن از گریه

**نسکیای** / niskyay/: چاوگ. نسکیان؛ بەرەنیسکێ دان ‹بەو ئەندۆی گەرم نسکیای گرینش/ بشانۆ وە تەرم زوڵف چین‌چینش «عەبدولوەهاب ئاریانی»› ☰ سکسکه کردن از گریه

**نسکین**[١] / niskîn/: ☜ **نسکیان**

**نسکین**[٢]: ☜ **نیسکێن**

**نسگەرە** / nisgere/: ☜ **نزگەرە**

**نسلین** / nislîn/: چاوگ. پسان ☰ گُسستن

**نسم** / nis(i)m/: ☜ **نیوە**

**نسیب** / n(i)sîb/: ناو. نسیو؛ نەسیب؛ نەسیو: ١. بەش ٢. بەخت ☰ ١. بهره ٢. شانس

**نسیبەت** / n(i)sîbet/: ناو. بەڵا؛ چۆرتم ☰ بلا

**نسیو** / n(i)sîw/: ☜ **نسیب**

**نسێ** / n(i)sê/: ناو. سێبەر؛ سێوەر ☰ سایه

**نش** / niş/: ☜ **نشکاف**

**نشاستە** / n(i)şaste/: ناو. نیشاستە؛ نیشاسە؛ گەردێکی سپییە، لە ئاو و ئەلکولدا دەتوێتەوە، لە شی بوونەوەدا دەبێتە چەن جۆر دێکسترین و گلۆکۆز، لە گیادا بە شێوەی هیدراتی کەربون پاشەکەوت دەبێ، زۆر ماکی خۆراکی، چەسپ و داودەرمانی لێ بەرهەم دێنن ☰ نشاسته

**نشاییش** / n(i)şayîş/: چاوگ. نشتش: ١. نیشتنەوەی باڵدار ٢. نیشتنەوە؛ هاتنەوە ژێر لە سەرڕا ٣. *[کینایە]* ئارام و ئۆقرە گرتن ☰ ١. بر زمین نشستن پرنده ٢. فرود آمدن ٣. آرام گرفتن

**نشت** / nişt/: ناو. ڕەوتی نزم بوونەوە؛ هاتنە خوار ☰ فرود

**نشتاو** / niştaw/: ناو. پاشاوی ئاودێری ☰ پساب آبیاری

**نشتاین** / niştayn/: چاوگ. سوار بوون؛ چوونە سەر خوانە زین ☰ سوار اسب شدن

**نشتش** / niştiş/: چاوگ. ١. ☜ **نشاییش** ٢. ڕۆنیشتن؛ دانیشتن؛ هەدا دان ٣. نووستن؛ خەفتن؛ ڕازان ٤. وێک کەوتن؛ لە یەک دان ☰ ١. ☜ **نشاییش** ٢. نشستن ٣. خوابیدن ٤. برخورد کردن

**نشتمان** / niştman/: ☜ **نیشتمان**

**نشتن** / niştin/: چاوگ. ١. نیشتن؛ نیشتنەوە (وەک دابەزینە سەر زەوی باڵدار) ٢. نیشتن؛ ڕۆنیشتن؛ دانیشتن؛ ڕۆنین ٣. نیشتن (وەک تڵتە کە دەنیشێتە ژێر دەفرەوە) ٤. نیشتن (وەک کەم کردنی بارستایی ئاو) ‹ئاوی بەربەندەکە نشتووە› ٥.

نیشتن؛ ئاوا بوونی خۆر ‹خۆر نشت› ٦. ڕیان؛ چوونە سەر پێشاو ‹هەر خوێن نشتووە!› 🇮🇷 ۱. فرود آمدن (پرنده بر زمین) ۲. نشستن ۳. رسوب کردن ۴. فرونشستن سطح آب ۵. غروب کردن ۶ ریدن

**نشتو** / nişţû/: ☜ **نوشته ـ۱**

**نشتەجێ** / nişţecê/: ☜ **نیشتەجێ**

**نشتەر** / nişter/: ناو. نژ؛ نژتەر؛ نشتێر؛ نەشتەر؛ نژد؛ نشتەل؛ نێشتەر؛ شفرە؛ کوشتەر؛ کاردێکی نووک‌تیژ بۆ هەڵدڕینی دمەڵ و برین 🇮🇷 نشتر

**نشتەرکار** / nişterkar/: ☜ **نەشتەرگەر**

**نشتەرکاری** / nişterkarî/: ☜ **نەشتەرگەری**

**نشتەل** / niştel/: ☜ **نشتەر**

**نشتەنە** / niştene/: چاوگ. دانیشتن؛ نیشتن؛ ڕۆنین 🇮🇷 نشستن

**نشتێر** / niştêr/: ☜ **نشتەر**

**نشخۆر** / nişxor/: ☜ **نوشخۆر**

**نشدار** / nişdar/: ☜ **نەشتەرگەر**

**نشر** / nişr/: ناو. قەی؛ لە دەمەوە هاتوو 🇮🇷 قی

**نشراندن** / nişrandin/: چاوگ. نشرین؛ ڕشانەوە؛ هاوردنەوە؛ هەڵهاوردن 🇮🇷 قی کردن؛ بالا آوردن

**نشرین** / nişrîn/: ☜ **نشراندن**

**نشس** / nişis/: ☜ **نشست**

**نشست** / nişist/: ناو. نشس؛ نشستی: ۱. ڕەوتی کەم بوونی قەدر و ڕێز ۲. خەسار؛ دۆخی زیان کردن لە ژیانا 🇮🇷 ۱. کاهش احترام ۲. زیان

**نشستی** / nişistî/: ☜ **نشست**

**نشف** / nişif/: ناو. ۱. چینێک لە بەرهەمی زەوین ۲. نهۆم؛ قات 🇮🇷 ۱. بار حاصل از محصول زمین ۲. طبقه؛ اشکوبه

▣ **نشفێ داوێ** ۱. پاشەبەر؛ دوامین بەشی بەرهەم ۲. نهۆمی هەرەبالا 🇮🇷 ۱. آخرین بار از محصول ۲. بالاترین طبقەی ساختمان

**نشڤین** / nişvîn/: چاوگ. زیڕاندن 🇮🇷 جیغ کشیدن

**نشک** / nişk/: ☜ **نشکاف**

**نشکا** / nişka/: ☜ **نشکاف**

**نشکاڤ** / nişkav/: ئاوەڵکار. نش؛ نشک؛ نشکا؛ نشکاڤک؛ نشکاڤی؛ نشکێڤە؛ نەژگاف؛ لەپڕ؛ گزوگومەت؛ ناخلاف 🇮🇷 ناگهان؛ یکهو

**نشکاڤک** / nişkavik/: ☜ **نشکاف**

**نشکاڤی** / nişkavî/: ☜ **نشکاف**

**نشکن** / nişkin/: ناو. دیواربڕ؛ ئاسنی دەستی دز بۆ دیوار برین 🇮🇷 ابزار دیوار سوراخ کردن دزد

**نشکنین** / nişk(i)nîn/: چاوگ. دیوار برین 🇮🇷 دیوار سوراخ کردن

**نشکێ** / nişkě/: ناو. باوێشک؛ باوەشک 🇮🇷 خمیازه

**نشکێڤە** / nişkêve/: ☜ **نشکاف**

**نشگاف** / nişgav/: ئاوەڵکار. لەنەکاو؛ لەپڕ 🇮🇷 ناگهان

**نشمی** / nişmî/: ئاوەڵناو. چەپەڵخوەر؛ دژخۆر 🇮🇷 کثیف‌خور

**نشوڤ** / n(i)şuv/: ☜ **نشێو**

**نشو** / n(i)şû/: ناو. خاڵی سەر پێست 🇮🇷 خال روی پوست

**نشوف** / n(i)şûf/: ناو. گێژاو؛ گێجاو 🇮🇷 گرداب

**نشوڤ** / n(i)şûv/: ناو. زنار؛ هەڵەت؛ ماهـ؛ هەڵەمووت؛ هەزار بە هەزار 🇮🇷 پرتگاه

**نشوک** / n(i)şûk/: ناو. تووتنی زۆر کوتراوی تاڵەبێژکراو کە تاقمێ دەیکەنە لووتیان 🇮🇷 انفیه

**نشیان** / nişyan/: ناو. مۆر و ناو بە بەڵگەوە 🇮🇷 مُهر و امضا بر سند

**نشیڤ** / n(i)şîv/: ناو. ۱. ☜ **نشێو** ۲. باشوور 🇮🇷 ۱. ☜ **نشێو** ۲. جنوب

**نشیمەن** / n(i)şîmen/: ناو. نشیمەنگا: ۱. جێگەی دانیشتن ۲. نیشتمان؛ جێگەی لێژیان 🇮🇷 ۱. جای نشستن ۲. میهن

**نشیمەنگا** / n(i)şîmenga/: ☜ **نشیمەن**

**- نشین** / n(i)şîn-/: پاشەوشە. ۱. جێی نیشتن و

دانیشـتن ‹خۆرنشـین؛ میرنشـین؛ شانشـین› ٢. دانیشـتوو لـە شـوێنێ ‹دێنشـین؛ کرانشـین؛ سەرنشین› ☰ ١و٢. ـ نشین

**نشینگە** / n(i)şînge/: نـاو. ١. جێگـەی نیشـتنی مەل ٢. جێگەی دانیشتن ‹وات: نشینگەی تەخت مـیرانی جـافم/ جاگـەی نـازاران مشـکین کلافـم «مینـەجاف»› ٣. نیشـتمان ‹ملـەی لەشـکەرگا هەنجیرک گێلە/ زێ و هیر تا هەوار نشینگەی خێلـە «ئاغا عینایەت»› ٤. جێگەی مانـەوە و نیشـتەجێ بوون (وەک ماڵ، میوانخانە و ...) ☰ ١. محل فـرود پرندە ٢. جای نشستن ٣. میهن ۴. اقامتگاه

**نشینە** / n(i)şîne/: ناو. لیس؛ شـوێنی تایبـەت بـۆ نیشتنەوەی باز و مەلی ڕاوکەر ☰ جای مخصوص نشستن پرندەی شکاری

**نشیو** / n(i)şîw/: ☜ نشێو

**نشیوی** / n(i)şîwî/: ☜ نشێوی

**نشێو**[1] / n(i)şêw/: نـاو. نشـوڤ؛ نشـیڤ؛ نشـیو؛ سربەرەژێرە ‹چون دژمنین دەگـەڵ یـەک و نیمانـە ئیتحاد/ ڕامان دەدەن بە جارێ لە هەورازێ بۆ نشـێو «سەیفولقوزات»› ☰ نشیب

**نشێو**[2]: ئاوەڵـناو. نشـوڤ؛ نشـیڤ؛ نشـیو؛ لێـژ؛ سەرەولێژایی؛ لێژ؛ سر بەرەژێرە ☰ شیبدار

**نشێوی** / n(i)şêwî/: ناو. نشیوی؛ لێژی ☰ سراشیبی

**نغرۆ** / niğro/: ئاوەڵـناو. نـوغرۆ: ١. ڕۆچـوو؛ نـوقم ‹کەشتییەک لە ئاوە ئازادەکاندا نغرۆ بوو› ٢. ڕۆچوو؛ نشست کردوو (زەوین) ٣. *[مەجاز]* تیاچوو؛ فـەوتاو ‹ئەم خەڵکەی پاراست، لـە فـەوتان و مـردن و نغـرۆ بوون «شێرکۆ»› ☰ ١. غرق ٢. نشست کردە (زمـین) ٣. نیست و نابود

**نفت**[1] / nift/: نـاو. ١. چلێسـی؛ زگـلـەوەڕێنی ٢. چلە شەمچە؛ چوکلە گۆگرد؛ چلـە شـخاتە ☰ ١. شکمپرستی ٢. چوب کبریت

**نفت**[2]: لێل. ← نفتونوێ ـ نفتونۆڵ

**نفتک** / niftik/: ناو. ١. کفتک؛ کوتیلک؛ کفتـە ٢. ☜ نفتەك ☰ ١. کوفتەی خوراکی ٢. ☜ نفتەك

**نفتونوێ** / nift û n(i)wê/: ئاوەڵـناو. نفـتونـۆڵ؛ نرتونوێ؛ تازە و کارنەکردوو ☰ تازە؛ نو

**نفتونۆڵ** / nift û noł/: ئاوەڵـناو. نفـتونـوێ؛ نرتونوێ؛ تازە و کارنەکردوو ☰ تازە؛ نو

**نفتونەو** / nift û new/: ☜ نرتونوێ

**نفتونەوە** / nift û newe/: ئاوەڵـناو. نوهین؛ تازە ☰ نوین

**نفتەک** / niftek/: نـاو. نفتـک؛ شـەمچە؛ کرمیـت؛ شقارتە؛ شخاتە ☰ کبریت

**نفر** / nifr/: ☜ نفرین

**نفـردی** / nifirdî/: نـاو. ڕەوتی مچـــوڕک دان و لەرزینی سووک ☰ فراشا؛ لرز خفیف

**نفرە**[1] / nifre/: ☜ نفرین

**نفرە**[2]: ئاوەڵـناو. دەرکراو بە سووکی لە نـاو کۆمـەڵ ‹نفرە بوویە› ☰ راندە شدە از جامعە

**نفرەلێکراو** / nifrelêk(i)raw/: ئاوەڵـناو. مـەلوون؛ مەلعوون ☰ ملعون؛ نفرین شدە

**نفرین** / nifrîn/: نـاو. نفـر؛ نفـرە؛ نـەفرە؛ نـەفرین؛ تووک؛ زۆتی؛ پشۆر؛ لەکۆلەڕۆ؛ ڕت؛ نـەوز؛ نـووەڕ؛ نوڕ؛ دوعای شەڕ ☰ نفرین

**نفز** / nifz/: ئاوەڵـناو. نفز: ١. نزم؛ نەوی ٢. *[مەجاز]* بەدناکار؛ بێئابڕوو ☰ ١. پست؛ کمارتفاع ٢. بدکردار

**نفسی** / nifsî/: ناو. جاوی سفتوسۆڵ ☰ متقال

**نفش** / nifş/: ناو. ١. تۆرەمە؛ بەرە ٢. نەوع؛ جۆر ☰ ١. نسل ٢. نوع

**نفلین** / niflîn/: چاوگ. کەوتن؛ کەفتن؛ بە عەرزدا دان ☰ افتادن

**نفـوورات** / n(i)fûrat/: ئاوەڵـناو. نـــەفوورات: ١. بەدفەڕ؛ بزۆز و بەزیان ‹منداڵەکان نفووراتێکن هـەر مەپرسـە!› ٢. سـەیر و سـەمەرە ☰ ١. بـیآرام و زیانرسان ٢. عجیب و غریب

**نفووس / nifûs/**: ناو. ١. ودم و شـوومی قسـەی کەسێک ‹نفووسی پیسە نەخۆشی خستم؛ نفـووس پاکـە هاتـە سـەرم چـاکی کردمـەوە› ٢. ژمـارەی بنیادەم لە ولاتێکدا ‹نفووس ئەم دێیە دەوری سـەد کەسە› ✍ ١. خجستگی و نحسی نفس ٢. نفوس

**نفووسنووس / nifûsnûs/**: ناو. سـەرژمێر؛ ئامـارگر؛ ئەوەی هەژماری جەماوەرێک دەژمێرێ ‹کارتێکی دامێ بـۆ لای نفـووسنـووس/ لـە بابـەت چێشـت و نووسینی نفووس «قانع»› ✍ سرشمار

**نڤ / niv/**: ناو. خەو ✍ خواب

**نڤات / n(i)vat/**: ناو. کاری لە خۆ دان؛ کاری سەر و سنگ بە لەپی دەست کوتان ✍ خودزنی

**نڤار / n(i)var/**: ئاوەڵناو. نـوێژەن؛ تازەداهـاتوو ✍ جدید (اختراع)

**نڤان / n(i)van/**: چاوگ. ١. خـەوتن؛ خـەفتن ٢. ناوین؛ هەڵسوون؛ سواخ دان ٣. *[کینایە]* قوڕەکاری کردن ✍ ١. خوابیدن ٢. اندودن کار بنایی انجام دادن

**نڤاندن / n(i)vandin/**: چاوگ. نڤستاندن؛ دەخـەو کردن؛ خەواندن ✍ خواب کردن؛ خوابانیدن

**نڤانی / n(i)vanî/**: نـاو. کـار لـە ڕەوتی خـانوو دروست کردندا ✍ کار در فرایند ساختمان‌سازی

**نڤت / nivt/**: ئاوەڵناو. ١. نووسـتوو؛ خـەوتوو؛ خەفتگ ٢. *[کینایە]* بێ‌برەو؛ کەسـاد ✍ ١. خوابیـده ٢. کساد؛ بی‌رواج

**نڤرشت / nivrişt/**: ☜ **نوشتە ـ١**

**نڤز / nivz/**: ☜ **نفز**

**نڤژاندن / nivjandin/**: چاوگ. دارکاری کردن؛ بە دار شەل و کوت کردن ✍ به شدت کُتک زدن

**نڤس / nivs/**: ناو. وەرم؛ خەو ✍ خواب

**نڤستاندن / n(i)vistandin/**: ☜ **نڤاندن**

**نڤستن / n(i)vistin/**: ☜ **نوستن**

**نڤستی / n(i)vistî/**: ئاوەڵناو. خـەوتوو؛ خـەفتگ ✍ خُفته

**نڤشت / n(i)vişt/**: ☜ **نوشتە ـ١**

**نڤشتۆک / n(i)viştok/**: ☜ **نوشتە ـ١**

**نڤشتی / n(i)viştî/**: ☜ **نوشتە ـ١**

**نڤشتیلۆک / n(i)viştîlok/**: ناو. گیایەکە ✍ گیـاهی است

**نڤشک / nivşik/**: ☜ **نویشك**

**نڤی / n(i)vî/**: ☜ **نەوی**

**نڤیس[1] / n(i)vîs/**: ناو. ١. پلاک؛ وشـە و ژمارەیـێ کە لە سەر درگا بۆ دیـاری کـردن دادەنرێـت ٢. وتار؛ نووسراوە ✍ ١. پلاک ٢. مقاله

**ـ نڤیس[2]**: پاشەوشە. ـ نووس: ١. ئـەوەی دەنووسـێ ‹دیرۆکنڤیس› ٢. ئەوەی نووسراوە ‹پـاکنڤـیس› ✍ ١و٢. ـ نویس

**نڤیسار / n(i)vîsar/**: ☜ **نوسەر**

**نڤیسان / n(i)vîsan/**: چاوگ. نڤیسین؛ نڤیساندن؛ قەڵەم بە سەر قاقەزدا هێنان ✍ نوشتن

**نڤیساندن / n(i)vîsandin/**: ☜ **نڤیسان**

**نڤیسخانە / n(i)vîsxane/**: ناو. دەفتەر؛ نووسـینگە ✍ دفتر

**نڤیسک / n(i)vîsik/**: نـاو. بەڵگەی نووسراو ✍ سند؛ مدرک

**نڤیسکار / n(i)vîskar/**: ☜ **نوسەر**

**نڤیسکی / n(i)vîskî/**: نـاو. وەرامـی بـە نووسـین؛ بەرانبەری لێڤکی ✍ پاسخ کتبی

**نڤیسگە / n(i)vîsge/**: ناو. پرسگە لە دام و دەزگای میریدا ✍ اطلاعات اداره

**نڤیسنگە / n(i)vîsinge/**: ☜ **نوسینگە**

**نڤیسەر / n(i)vîser/**: ☜ **نوسەر**

**نڤیسەڤان / n(i)vîsevan/**: ☜ **نوسەر**

**نڤیسیار / n(i)vîsyar/**: نـاو. نویسـیار؛ ئیـدیتۆر؛ کەسێ کە بەرهەمی نووسـەرانی تـر هەڵـەگری، ڕێکوپێک و ئامـادەی چـاپ دەکـا ✍ ویراسـتار؛ ادیتور

**نڤیسین** / n(i)vîsîn/: ☜ **نڤیسان**

**نڤیشتیلۆک** / n(i)vîştîlok/: ناو. جانای شوان؛ گیایەکە ☰ گیاهی است

**نڤیشک** / n(i)vîşk/: ☜ **نویشك**

**نڤین** / n(i)vîn/: ☜ **نوێن[1]ـ۱**

**نڤینپۆش** / n(i)vînpoş/: ☜ **نڤینۆ**

**نڤینپووش** / n(i)vînpûş/: ☜ **نڤینۆ**

**نڤینۆ** / n(i)vîno/: ناو. نڤینپۆش؛ نڤینپووش؛ سەرەنناز؛ لحێف ☰ لحاف؛ پتو

**نڤینۆک** / n(i)vînok/: ناو. قەرەوێڵە؛ تەختی خەوی دووکەسە ☰ تختخواب دونفره

**نڤێژ** / n(i)vêj/: ☜ **نوێژ**

**نڤێژا بارانێ** / n(i)vêja baranê/: ☜ **نوێژەبارانە**

**نڤێژبەر** / n(i)vêjber/: ناو. پێش‌نوێژ؛ ئیمام ☰ پیشنماز

**نڤێژکەر** / n(i)vêjker/: ☜ **نوێژخوێن**

**نڤێژگە** / n(i)vêjge/: ☜ **مزگەوت**

**نق[1]** / niq/: ئاوەڵناو. ۱. قووڵ ‹لە گۆمێکی نقا مەلەم کرد› ۲. پڕ و قەرەباڵغ ‹بازاڕ ئەمڕۆ نق بوو› ☰ ۱. ژرف؛ عمیق ۲. شلوغ

**نق[2]**: دەنگەناو. خوستە؛ خوست؛ وستە ‹لێرە ژێر دانیشە! نقت دەر نەیێ!› ☰ جیک؛ کمترین صدا

⊡ **نق لێ بڕیان**: لاڵ بوون؛ دەنگ لێوە نەهاتن ‹بۆچە نقت لێ بڕیاگە؟ مەترسە! قسە بکە!› ☰ لالمونی گرفتن

**نق نەکردن**: هیچ نەگوتن؛ سرتە نەکردن ‹باوکیشی لەوێ بوو، بەلام نقی نەکرد› ☰ لام تا کام حرف نزدن

**نقا** / n(i)qa/: ☜ **نزا**

**نقار** / n(i)qar/: ناو. گلەیی؛ قا ‹نقاریکی بەرانبەر من هەیە› ☰ نِقار

**نقارین** / n(i)qarîn/: چاوگ. لە دەس نەهاتن؛ توانای کارێ نەبوون ☰ نتوانستن؛ از دست برنیامدن

**نقارە** / n(i)qaře/: ☜ **نەقارە**

**نقام** / n(i)qam/: ناو. ۱. قام؛ گۆرانی؛ مەقام ۲. ڕەوتی گۆرانی ☰ ۱. ترانه ۲. ملودی

**نقان** / n(i)qan/: ☜ **نەقان ـ۲**

**نقاندن** / n(i)qandin/: چاوگ. نقانن: ۱. نقای؛ نقنای؛ خۆ ڕێک کوشین و زۆر هێنان ۲. دەنگ لە گەروو دەرهێنان ‹زۆری نقاند، کەس لێی حاڵی نەبوو› ۳. قووجاندن؛ نووقاندن؛ پێکەوە نان ‹چاوی نقاندووە› ☰ ۱. زور زدن ۲. صدای نامفهوم از گلو درآوردن ۳. بر هم نهادن

**نقانق** / n(i)qaniq/: ئاوەڵناو. پڕاوپڕ ☰ مالامال

**نقانن** / n(i)qanin/: ☜ **نقاندن**

**نقای** / n(i)qay/: ☜ **نقاندن ـ۱**

**نقتک** / niqtik/: ناو. دوامین هەناسە ☰ نفس‌های آخر

**نقتە** / niqte/: ☜ **نوقتە**

**نقتەبانگ** / niqtebang/: ناو. نیشانەی سەیرمان و لەگەڵ بوون (!) ☰ علامت تعجب و خطاب (!)

**نقتەبهنۆک** / niqtebihnok/: ناو. نیشانەی نێوان و لە سەر گرتنەوە (،) ☰ ویرگول؛ کاما (،)

**نقتەپرس** / niqtepirs/: ناو. نیشانەی پرسیار لە نووسینا (؟) ☰ علامت سؤال (؟)

**نقتەجۆت** / niqtecot/: ناو. نیشانەی ڕاژە کردن (:) ☰ دونقطه؛ علامت توصیف (:)

**نقتەشانی** / niqteşanî/: ناو. خاڵی سەر پیت ☰ نقطەی حروف

**نقر** / niqir/: ناو. ۱. نێوان ددانەی هەرە و شانە و شتی وا ۲. نێوان پلەی پەیژە و پلەکان ۳. نێوان پلەکی گەرماپێو ٤. تیسکێک لە کولکە و موو ☰ ۱. میان دندانەهای ارّه و شانه و مانند آن ۲. میان پلەهای نردبام و پلکان ۳. فاصلەی درجات دماسنج ۴. کمی از مو و پشم

**نقراندن** / niqrandin/: چاوگ. ۱. پلە بۆ دانان ۲.

نرخاندن 🇮🇷 ١. درجه‌بندی کردن ٢. ارزیابی کردن

**نقرنقر** / niqrniqr/: ئاوه‌ڵناو. ١. پله ـ پله؛ پله‌ک لێ دراو ٢. له‌له‌کراو 🇮🇷 ١. مُدرّج ٢. کنده‌کاری شده

**نقره** / niqre/: ناو. تیان؛ تیانه؛ قازان؛ به‌رۆشی مه‌زن 🇮🇷 دیگ بزرگ

**نقک** / niqik/: ئاوه‌ڵناو. په‌ڵپگر؛ به بهانه 🇮🇷 بهانه‌گیر

**نقم** / niqm/: ☜ نوقم ـ١

**نقن** / niqin/: ئاوه‌ڵناو. زۆر نقه‌نق‌که‌ر 🇮🇷 غُرغُرو

**نقنای** / niqnay/: ☜ نقاندن ـ١

**نقوج** / n(i)quc/: ☜ نوقورچك

**نق‌وجڕ** / niq û ciř/: ده‌نگه‌ناو. نیخه‌نیخ له ڕاکێشان و بار کردنی شتی گران ‹به نق‌وجڕ هێنایان› 🇮🇷 نکیدن از حمل چیز سنگین

**نقوچ** / n(i)quc/: ☜ نوقورچك

**نقورچ** / n(i)qurç/: ☜ نوقورچك

**نقورچک** / n(i)qurçik/: ☜ نوقورچك

**نقوستان** / n(i)qustan/: ☜ نوقسان

**نقول** / n(i)qul/: ناو. کون؛ قول؛ کونا 🇮🇷 سوراخ

**نقوڵ** / n(i)quł/: ☜ نوقڵ

**نقوم** / n(i)qum/: ☜ نوقم ـ١

**نقۆ** / n(i)qo/: ☜ نوقم ـ١

**نقۆت** / n(i)qot/: ئاوه‌ڵناو. قلپ؛ وه‌رگه‌ڕاو؛ سه‌رنخوون 🇮🇷 سرازیر؛ وارونه

**نقۆک**[١] / n(i)qok/: ناو. ١. ماسی زل که هه‌میشه له ژێر ده‌ریادایه ٢. ژێرده‌ریایی 🇮🇷 ١. ماهی بزرگی که همواره زیر آب است ٢. زیردریایی

**نقۆک**[٢]: ئاوه‌ڵناو. توانا له چوونه ناخه‌وه 🇮🇷 عُمق‌رو

**نقو** / n(i)qû/: ☜ نوقم ـ١

**نقوت** / n(i)qût/: ناو. دڵۆپه؛ تنۆک 🇮🇷 چکه

**نقوتان** / n(i)qûtan/: چاوگ. تکان؛ تکین 🇮🇷 چکیدن

**نقوتاندن** / n(i)qûtandin/: ناو. تکه/ دڵۆپه کردن؛ تنۆک دادان 🇮🇷 چکه کردن

**نقوچ** / n(i)qûç/: ☜ نوقورچك

**نقوچاندن** / n(i)qûçandin/: ناو. نقورچک گرتن 🇮🇷 نیشگون گرفتن

**نقوم** / n(i)qûm/: ئاوه‌ڵناو. قوم؛ نقووم؛ نخرۆ؛ بناو 🇮🇷 غرق

**نقه**[١] / n(i)qe/: ناو. ناقه؛ نه‌ققه؛ نه‌قه؛ باقۆ؛ جۆرێ ماسی 🇮🇷 نوعی ماهی

**نقه**[٢]: ده‌نگه‌ناو. نه‌ققه: ١. ده‌نگی زۆر بۆ خۆ هێنان ٢. که‌مترین ده‌نگ 🇮🇷 ١. صدای زور زدن ٢. کمترین صدا

◘ **نقه نه‌کردن/ نه‌هاتن:** ده‌نگ لێ ده‌رنه‌هاتن؛ ته‌واو کش‌ومات بوون ‹هه‌چیکیان پێ گوت و هه‌ر جنێویکیان پێ دا، نقه‌ی نه‌هات› 🇮🇷 کاملاً ساکت بودن

**نقه‌نق** / n(i)qeniq/: ده‌نگه‌ناو. ١. نقه‌ی یه‌ک له دوای یه‌ک ٢. *[مه‌جاز]* کاری زۆر بۆ خۆ هێنان ‹شیعر وتن به نقه‌نق و زۆر بۆ خۆ هێنان نابێ› 🇮🇷 ١. صدای نکیدن پیاپی ٢. عمل به خود فشار آوردن

**نقیان** / niqyan/: چاوگ. قووچان؛ قووچیان؛ قووژیان؛ چووقان 🇮🇷 برهم نهاده شدن

**نقیم** / n(i)qîm/: ☜ نقێم

**نقێم** / n(i)qêm/: ناو. نقیم؛ قاشه ئه‌نگوستیله ‹هه‌ر پێنج په‌نجه‌که‌ت نقێمی شینه/ یاره‌که‌م ئه‌ڵێی کۆتری نه‌خشینه «فولکلۆر»› 🇮🇷 نگین

**نک**[١] / nik/: ☜ نکل

**نک**[٢]: ئاوه‌ڵناو. ١. وردی ئالابێژکراوی نه‌رم ٢. بێچاره؛ هه‌ناسه‌سارد 🇮🇷 ١. آرد شده ٢. بیچاره

**نک**[٣]: ده‌نگه‌ناو. ده‌نگی کزی ناڵه 🇮🇷 صدای ناله‌ی ضعیف

**نک**[٤]: ئامراز. کن؛ جه‌م 🇮🇷 نزد

**نکا** / n(i)ka/: ناو. ١. ☜ نیکاح ٢. ماره‌یی؛ ماره‌بڕانه 🇮🇷 ١. ☜ نیکاح ٢. مهریّه

**نکال / n(i)kal/**: ناو. لا؛ تەرەف ‹لە چار نکالا خۆ نهیری› 🇮🇷 طرف؛ جانب

**نکاندن / n(i)kandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //نکاندت؛ دەنکێنی؛ بنکێنە// نکانن؛ نالاندنی سووک لە بن بار یان لە بەر ناخۆشی ‹نەنکێنی ڕێگاکەم دوورە/ مردن ئاخرین سنوورە «کاک ئەحمەد»› 🇮🇷 نکیدن؛ نالیدن خفیف

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەنکاندن

**نکانن / n(i)kanin/**: ☜ **نکاندن**

**نکاو / n(i)kaw/**: ☜ **ناکاو**

**نکای / n(i)kay/**: ئاوەڵکار. ١. تا ئێستاش ٢. هەر چۆنێک بێت 🇮🇷 ١. هنوز هم ٢. در هر حال

**نکاین / n(i)kayn/**: ئاوەڵکار. هەر ئێستاکێ؛ هەمانهۆ 🇮🇷 همین حالا

**نکتە / nikte/**: ☜ **نوکتە**

**نکتەبێژ / niktebêj/**: ☜ **نوکتەباز**

**نکتەزان / niktezan/**: ئاوەڵناو. زۆر زان لە قسەی جەفەنگیدا 🇮🇷 طنزگو

**نکس[1] / niks/**: ناو. ڕەوتی وەرگەڕان 🇮🇷 بازگشت

**نکس[2]**: ئاوەڵناو. شۆڕەوە بوو؛ داهێزاو 🇮🇷 فروهشته

**نکساندن / niksandin/**: چاوگ. ١. گەڕاندنەوە ٢. شۆڕەوە کردن 🇮🇷 ١. برگرداندن ٢. فروهشتن

**نکسین / niksîn/**: چاوگ. ١. بە پاشدا وەرگەڕان ٢. شۆڕەوە بوون 🇮🇷 ١. بە عقب برگشتن ٢. فروهشتن

**نککێنە / nikkêne/**: ☜ **نکێتە**

**نکل / nikil/**: ناو. نک؛ نکول؛ نوکل؛ نوکوول؛ نووک؛ نەقور؛ نیکل؛ دەنووک؛ دەندووک؛ دندووک 🇮🇷 منقار

**نکلاندن / niklandin/**: چاوگ. بە دەندووک لێ دان 🇮🇷 منقار زدن

**نکلدەر / nikilder/**: ناو. کون-کونی جێ دەندووک 🇮🇷 سوراخهای جای منقار

**نکل‌ونکین / nikl û nikîn/**: ناو. نەکنەکیل؛ دوو فریشتەی خوا کە تازە مردوان بەر پرسیاران ئەدەن 🇮🇷 نکیر و مُنکر

**نکن / nikin/**: ئاوەڵناو. نکەکەر 🇮🇷 بسیار نالان

**نکنای / niknay/**: چاوگ. نکاندن 🇮🇷 نالیدن

**نکنکە / nikn(i)ke/**: ☜ **نکێتە**

**نکوچک / n(i)kuçik/**: ☜ **نوقورچك**

**نکول / n(i)kul/**: ☜ **نکل**

**نکونالّ / nik û nał/**: ☜ **نك‌ونالّە**

**نکونالە / nik û nałe/**: ناو. نرک‌ونالە؛ نک‌ونالّ؛ نالەی هێواش و زۆر؛ نکەی سەبر و لە سەر یەک 🇮🇷 نالەهای آهسته و پیاپی

**نکوناهمێ / nik û nah(i)mê/**: ☜ **نسك‌وناهمێ**

**نکوناهومێ / nik û nahumê/**: ☜ **نسك‌وناهمێ**

**نکونوار / nik û n(i)war/**: ئاوەڵناو. نۆنەوار: ١. تەرپۆش؛ بە جل‌وبەرگی تازە و ڕازاوەوە ‹ئارامم بینی تەواو نک‌ونوار ببوو› ٢. نفت‌ونۆڵ؛ تازە و نوێ؛ نفت‌ونوێ (بۆ جل‌وبەرگ و کەوش) ‹کەوشەکانم شۆرد و بۆیەم کردن، نک‌ونوار بوونەوە› 🇮🇷 ١و٢. نونوار

**نکونەوە / nik û newe/**: ئاوەڵناو. نرت و نوێ؛ نفت ونەو 🇮🇷 نو؛ کاملاً تازه

**نکۆڵ / n(i)koł/**: ☜ **نکۆڵی**

**نکۆڵی / n(i)kołî/**: ناو. نکۆڵ؛ ئینکار؛ کار و ڕەوتی حاشا کردن؛ نەدرکانی ڕاستی ‹بیشمکوژن، نکۆڵی لە کورد بوونی خۆم ناکەم› 🇮🇷 انکار

**نکوول / n(i)kûl/**: ئاوەڵناو. نکۆڵ؛ نوکوول: ١. پەژیوان؛ پەشیمان ٢. شارەزا؛ لێزان ٣. حاشاکراو 🇮🇷 ١. پشیمان ٢. ماهر ٣. انکار شده

⊡ **نکوول بوون**: تووش بوون؛ گیرۆدە و دەسەپاچە بوون 🇮🇷 گرفتار شدن

**نکوول کردن**: پەژیوان بوونەوە؛ پاشگەز کردنەوە ‹چاوی لە وەعدی کوشتنی من چاوی دزییەوە/ خوونکاری وا دەبێ لە قسەی خۆی نەکا نکوول

«مەحوی»› ☰ پشیمان شدن

**نکولی / n(i)kûlî/:** ناو. نوکوولی: ١. پەژیوانی لە گفت و بەڵێن ٢. حاشا؛ ئینکار ‹کێ هەیە نکوولی لێ بکا؟› ٣. کەموکووڕی ☰ ١. پشیمانی از عهد ٢. حاشا ٣. نُقصان

⊡ **نکولی (لێ) کردن:** دانە ژێر قەوڵ و قەرار یا هەر بابەتێکدا ☰ زیر قول زدن

**نکولی هێنان:** تووشی کەموکووڕی بوون ☰ کم آوردن

**نکە / n(i)ke/:** دەنگەناو. دەنگی نەفەس‌تەنگی شەکەت و لەش‌بەبار ☰ هِن‌ـهِن خسته و بیمار

**نکەکەر / n(i)keker/:** ☜ **نکن**

**نکەنک / n(i)kenik/:** دەنگەناو. نکەی زۆر ☰ هِن ــ هِن پیاپی

**نکین / n(i)kîn/:** چاوگ. ١. ناڵین؛ ناڵاندن ٢. نکەی زۆر و بە دووی یەکدا کردن ☰ ١. نالیدن ٢. ناله‌های پیاپی و کوتاه سر دادن

**نکینە / n(i)kêne/:** ناو. نککینە؛ مکینە؛ نکنکە: ١. تۆرەمە باڵندەیەکی بەڵەکن، لاقیان درێژ و باریک و دندووکیان درێژە، لە قەراغ تەنکاواندا دەژین، بریتین لە: چەکمەسوورە و نکێنە ٢. باڵندەیەکە لە تۆرەمەیەک هەر بەم ناوە، نزیک ٤٢ سانتی‌میتر دەبێ، خێرا و بە پیڕۆیە و بە ناوی ئاوی تەنکدا دەڕوا و دەخوا ☰ ١و٢. آوست؛ چوب‌پا

**نگ / nig/:** ناو. ١. لاق؛ پا؛ لنگ ٢. جێ سێرەی چەکی گەرم ☰ ١. پا ٢. مگسک اسلحه

**نگا / n(i)ga/:** ناو. ئاگا؛ ئاگاداری؛ چاوەدێری ☰ نگهداری؛ محافظت

⊡ **نگا هێشتن:** ١. نگاداری کردن؛ ئاگا لێ‌بوون ‹نگای بێرە تا تێمەوا› ٢. گرتن؛ دەرفەتی جووڵان لێ بڕین ☰ ١. مُراقبت کردن ٢. نگهداشتن

**نگادار / n(i)gadar/:** ☜ **نیگادار**

**نگاداری / n(i)gadarî/:** ناو. کاری ئاگا لێ بوون؛ پارازتن ☰ نگهداری

**نگار / n(i)gar/:** ☜ **نیگار**

**نگارە / n(i)gare/:** ناو. وێنە؛ شکڵ ☰ نگاره

**نگارین[1] / n(i)garîn/:** چاوگ. شکڵ کێشان ☰ نقاشی کردن

**نگارین[2]:** ئاوەڵناو. نەخشاو؛ ڕەنگاوڕەنگ کراو ☰ مُنقش

**نگت / nigit/:** ناو. ١. ئیزگەی ناو ڕێگەی قەتار ٢. پولیسخانە ☰ ١. ایستگاه بین راهی قطار ٢. قرارگاه پلیس

**نگریس / nigrîs/:** ئاوەڵناو. نەگبەت؛ قۆشمە ‹پیلانی نگریس؛ دەسەڵاتی نگریس› ☰ شوم

**نگرین / nigrîn/:** چاوگ. تووڕە بوون ☰ عصبانی شدن

**نگس / nigs/:** ناو. ١. کەلەکە؛ خاڵیگە ٢. ژان و برک؛ نەخۆشی کەلەکە ☰ ١. پهلو ٢. درد پهلو

**نگل / nigil/:** ناو. *[ئاشیرین]* قوونەک؛ پشتە نێری حیز ☰ اُبنه

**نگم / nigm/:** ☜ **نوقم**

**نگمەسار / nigmesar/:** ☜ **نوقمەسار**

**نگونک / n(i)gûnik/:** ☜ **نەوەژن**

**نگە / n(i)ge/:** ناو. ئارەزوو؛ تاسە ☰ اشتیاق

**نگین / n(i)gîn/:** ناو. ١. نقێم؛ قاش؛ قاشەئەنگوستیلە؛ بەردی ڕازاوەی سەر ئەنگوستیلە ٢. بەخت؛ تالح ‹نگینی هاوردووە› ☰ ١. نگین ٢. شانس

**نم[1] / nim/:** ناو. ١. تەڕایی؛ شە؛ شێ ٢. *[کینایە]* کاری ئیلاقە کردن ☰ ١. نَم ٢. مُقاربت

⊡ **نم دان:** ١. تەڕایی دان ٢. *[مەجاز]* درکاندن؛ درخستن ☰ ١. تراوش کردن ٢. بروز دادن

**نم دانەوە:** تەڕایی گەڕانەوە؛ لێ‌چوون ‹ئەم گۆزە نم ئەداتەوە› ☰ نم پس دادن

**نم كێشان:** تەڕایی بۆ خۆ کێشان 🇮🇷 نم کشیدن

**سەوادی کەسێ نم دانەوە:** ☜ سەواد

**سەوادی کەسێ نم کێشان:** ☜ سەواد

**نم**[2]: ئاوەڵناو. ١. نزم؛ پێچەوانەی بڵند ٢. کورت؛ کۆتا 🇮🇷 ١. پست ٢. کوتاه

**نما**[1] / n(i)ma/: ناو. ١. ☜ **نوێژ** ٢. دیمەن 🇮🇷 ١. ☜ **نوێژ** ٢. منظره

**نما**[2]: پاشەوشە. ـ نوێن ‹قیبلەنما› 🇮🇷 ـ نما

**نماز** / n(i)maz/: ☜ **نوێژ**

**نمازە** / n(i)maze/: ☜ **نەخوازە**

**نماکاری** / n(i)makarî/: ناو. ڕووکاری 🇮🇷 روکاری

**نمان** / n(i)man/: چاوگ. ١. خۆ شاندان ٢. خووسان؛ نەرم بوونەوە لە ئاو و هەر چەشنە تەوشێکدا 🇮🇷 ١. خود را نمایاندن ٢. نرم شدن در آب

**نمانا** / n(i)mana/: ☜ **نموونە**

**نماندن** / n(i)mandin/: ناو. خووساندن؛ لە ئاو یان تراوێکی تردا هێشتنەوە تا نەرم دەبێ 🇮🇷 خیساندن

**نمانە** / n(i)mane/: ☜ **نموونە**

**نماو**[1] / n(i)maw/: ناو. نم و شەی بن تێکوڵی دار و گیا 🇮🇷 نم زیر پوستەی درخت و گیاه

**نماو**[2]: ئاوەڵناو. خووساو؛ فیسیاگ 🇮🇷 خیسیده

**نماوی** / n(i)mawî/: ☜ **نمدار**

**نمایش** / n(i)mayiş/: ناو. نمایشت؛ کاز و ڕەوتی ڕانان؛ نیشاندانی کاڵا و شت و هەرچی کە شیاوی دیتن بێ ‹ئەم نمایشە هێڵنجاوەرە کۆتایی نەهات؟ «پەشێو»› 🇮🇷 نمایش

**نمایشت** / n(i)mayişt/: ☜ **نمایش**

**نمایشگا** / n(i)mayişga/: ناو. پیشانگە؛ پیشانگا؛ نیشانگە؛ ڕانگە؛ جێگەی ڕانان ‹نمایشگای ماشین؛ نمایشگای نەقاشی› 🇮🇷 نمایشگاه

**نمتک** / nimtik/: ناو. نز؛ زنە؛ نەشت 🇮🇷 تراوش

**نمدار** / nimdar/: ئاوەڵناو. نماوی؛ شەدار؛ شێدار 🇮🇷 نمدار؛ نمناک

**نمدەر**[1] / nimder/: ناو. مەندەر؛ دۆشەکۆڵە 🇮🇷 تُشکچە

**نمدەر**[2]: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی شتێ کە تەڕایی ئەداتەوە 🇮🇷 تراوش دهنده

**نمرج** / nimric/: ئاوەڵناو. ڕووگرژ؛ مۆن؛ ناوچاوتاڵ 🇮🇷 اخمو

**نمرە** / nimre/: ناو. ١. پلە؛ دەرەجە ٢. ژمارە بۆ ئەزموونی دەرس‌خوێنان ٣. حەمامی تاقەکەسە 🇮🇷 ١. درجه ٢. نُمره ٣. حمام یک‌نفره

**نمز** / nimz/: ☜ **نزم**

**نمس** / nims/: ناو. گیاندارێکە بە قەد پشیلە، مشک و مار دەخوا 🇮🇷 جانوری اندازەی گربه، موش و مار شکار می‌کند

**نمسار** / nimsar/: ئاوەڵناو. نمدار؛ نماوی 🇮🇷 نمناک

**نمناک** / nimnak/: ☜ **نمین**

**نم‌نم**[1] / nim nim/: ناو. ١. نمەنم؛ نمەنوڵ؛ نمەنمە؛ بارینی کەم‌کەم و لەسەرخۆ ٢. زەنگیانە؛ منمنە؛ نمنمۆک؛ مووروو‌ی ورد 🇮🇷 ١. نم نم باران ٢. منجوق؛ مُهرەی ریز زینتی

**نم ـ نم**[2]: ئاوەڵکار. نمەنم؛ نمەنوڵ؛ نمەنمە؛ کەم‌کەم و لەسەرخۆ ‹ نم ـ نم دەبارێ› 🇮🇷 نم ـ نم

**نمنمۆک** / nimn(i)mok/: ناو. ١. زەنگیانە؛ منمنە ٢. جۆرێ پەپوولە؛ منمنۆک 🇮🇷 ١. منجوق ٢. نوعی پروانه

**نمنمە** / nimn(i)me/: ناو/ ئاوەڵکار. تووکە ـ تووکە؛ تووکەتووک 🇮🇷 نم ـ نم

**نمورئاو** / n(i)mur'aw/: ناو. میزاو؛ ئاوی زۆر کەم 🇮🇷 آب باریکه

**نموج** / n(i)mûc/: ☜ **نموونە**

**نموچ** / n(i)mûç/: ☜ **نموونە**

**نموود** / n(i)mûd/: ناو. ١. ڕەوتی کەوتنە بەرچاو؛ دەرکەوتن و سەرنج‌ڕاکێش بوون ‹نەختە ـ نەختە کارەکەی نموودی هێنا و خەڵک بایەخیان پێ دا› ٢.

بەرچاوی؛ سەرنجڕاکێشی ‹لێرە نموودی نییە ئەشێ بچێتە سەرترەوە› ٣. قەلافەت؛ دیمەن ‹کاورایەکی بێ‌نموودە، بە دلمەوە نانیشێ!› ☰ ١و٢. نمود ٣. سیما؛ قیافە

**نموودە** / n(i)mûde/: ☜ **نموونە**

**نمووس** / n(i)mûs/: ناو. پەڵەی ڕوخسار ☰ ککمک

**نموونە**[1] / n(i)mûne/: ناو. نمانا؛ نمانە؛ نمووج؛ نمووچ؛ نموودە؛ نمینە؛ نەموچ؛ نەموش؛ نەمووش: ١. پاژ یان ڕێژەیەک لە کۆمەڵێ، بۆ پیشاندان و لێکدانەوەی چۆنیەتی کۆمەڵەکە ‹نموونەمان بۆ بێنن تا لێکی دەینەوە› ٢. کەس یان شتێک کە ناسێنەری تاقم، دەستە یان جۆرێکی دیاریکراوە ‹نموونەی مرۆڤایەتی› ٣. بەشێکی کەم لە جەماوەرێکی ئاماری کە لە دانستەکانی دەکۆڵنەوە تا ئەمجار لەمەڕ گشت کۆمەڵەکەوە زانیاری دەست بخەن ‹نموونەی ژمێرکۆیی› ٤. ئەو شتە وا کۆمەڵە شتێکی هاوجۆری لە ڕوو دروست دەکەن ‹ئەم کەوشانەمان لە ڕووی نموونە ئیتالیاییەکەی دووریوە› ٥. دەقێک لە نووسراوی پیتچن‌کراو بۆ هەڵە گرتن ‹نموونەی یەکەم هەڵەی زۆر بوو› ☰ ١تا٥. نمونە

**نموونە**[2]: ئاوەڵناو. نمانا؛ نمانە؛ نمووج؛ نمووچ؛ نموودە؛ نمینە؛ نەموچ؛ نەموش؛ نەمووش: نوێنەک؛ گرۆبەر؛ سەرمەشق؛ خاوەن تایبەتمەندییەکی وا کە ببێتە پێوەر بۆ دیتران ‹ژنی نموونە؛ قوتابخانەی نموونە› ☰ نمونە

**نمە**[1] / n(i)me/: پێشوشە. کەمە ـ؛ وردیلە ‹نمەباران؛ نمەبا› ☰ نم ـ

**نمە ـ**[2]: پێشوشە. کەمە ـ؛ وردیلە ‹نمەباران؛ نمەبا› ☰ نَم ـ

**نمەبا** / n(i)meba/: ناو. بایێ کە تەڕایی پێوەیە ☰ باد مرطوب

**نمەباران** / n(i)mebaran/: ناو. بارانی لەسەرخۆی وردیلە ‹نمەبارانێک باریوە› ☰ باران نم

**نمەد** / n(i)med/: ناو. نەوگ؛ نەوو؛ تەحت؛ کولاو؛ لباد؛ لوا ☰ نمد

**نمەدزین** / n(i)medzîn/: ☜ **نەرمەزین**

**نمەدماڵ** / n(i)medmał/: ناو. کەسێ کە لباد دروست دەکا ☰ نمدمال

**نمەز** / n(i)mez/: ئامراز. *[سووکەڵە]* نازانم ‹خولاسە دل و جەرگم جە هوونەن/ نمەز ئەحوالات مەجنوونم چوونەن «خانای قوبادی»› ☰ نمی‌دانم

**نمەک** / n(i)mek/: ناو. ١. مەکی؛ خوێ؛ خوا ٢. *[مەجاز]* دەلالی و دلکێشی ٣. تەڕایی کەم ☰ ١. نمک ٢. جذّابیت و دلربایی ٣. نم اندک

▣ **نمەک کردن**: ١. خوێ کردن؛ خوێ پاشینە سەر خۆراکیدا ٢. *[کینایە]* نان و نمەک کردن؛ نانی کەسێک خواردن ☰ ١. نمک ریختن ٢. نمک کسی را خوردن

**نمەکاو** / n(i)mekaw/: ناو. ئاوخوێ؛ خوێاوک ☰ آب نمک

**نمەکبەحەرام** / n(i)mek be ĥeram/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* سپڵە؛ بێ‌ئەمەگ ☰ نمک‌نشناس

**نمەکپەروەردە** / n(i)mek perwerde/: ناو. *[مەجاز]* نانخۆر؛ ئەوەی بۆ ماوەیەک میوانی دلۆڤانی، چاکە و میوانداری یەکێکی‌تر بووبێت ☰ نمک‌پرورده

**نمەکدار** / n(i)mekdar/: ☜ **نمەکین**

**نمەکدان** / n(i)mekdan/: ناو. خوێدان؛ مەکدان؛ خوێدانک؛ خوادان؛ دەفری چکۆلەی جێ خوێ بۆ سەر سفرە ☰ نمکدان

**نمەککوێر** / n(i)mek k(i)wêr/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* سپڵە؛ بێ‌نەزان ☰ نمک‌نشناس

**نمەکگیر** / n(i)mekgîr/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* تووشی بەلاهاتوو لە سزای بێ‌ئەمەگی و سپڵەییدا

‹چاوه‌که‌م ئه‌مرۆ له‌ گوڵشه‌ن گوڵ به‌ عیشوه‌ خۆی نواند/ نه‌ک نمه‌ک‌گیر بم، به‌ مه‌رگی تۆ قه‌سه‌م هیچ نه‌مدواند «حه‌ریق»› ⊑ سرخورده از نمک‌ناشناسی

**نمه‌کناس** / n(i)meknas/: ئاوه‌ڵناو. *[مه‌جاز]* به‌ئه‌مه‌گ؛ وه‌فادار. هه‌روه‌ها: **نمه‌کناسی** ⊑ حق‌شناس

**نمه‌کنه‌ناس** / n(i)meknenas/: ئاوه‌ڵناو. سپڵه‌؛ پێ‌نه‌زان؛ نمه‌ک‌کوێر ⊑ نمک‌نشناس

**نمه‌کین** / n(i)mekîn/: ناو. نمه‌کدار؛ جوانی دڵکێش ⊑ زیبای نمکین

**نمه‌نم** / n(i)menim/: ☜ **نمنم**[1] ـ١

**نمه . نمه**[1] / n(i)men(i)me/: ناو. تنۆک ـ تنۆک ‹نمه ـ نمه‌یه‌کی خۆش ئه‌بارێ› ⊑ نم‌نمک

**نمه . نمه**[2]: ئاوه‌ڵکار. له‌سه‌رخۆ؛ ورده ـ ورده ‹هۆ لووتکه‌ی به‌رز!/ مل هه‌ڵبڕه‌ و به‌و هه‌وره‌ ته‌نیایه‌ بڵێ:/ ... نمه ـ نمه‌ با ببارێ «شێرکۆ»› ⊑ نم‌نمک

**نمه‌نوڵ** / n(i)menuł/: ☜ **نمنم**[1] ـ١

**نمه‌و** / n(i)mew/: ناو. ته‌حت؛ لباد ⊑ نَمَد

**نمی** / nimî/: ☜ **نمیا**

**نمیا** / nimya/: ئاوه‌ڵناو. نمیای؛ نمی؛ نما؛ خووسا ⊑ خیس خورده

**نمیای** / nimyay/: ☜ **نمیا**

**نمین** / n(i)mîn/: ئاوه‌ڵناو. شۆدار؛ نمناک ‹نمین بۆ جه‌مین جه‌م نمای جامش/ په‌شێو بۆ زوڵفان خه‌یاته‌ی خامش «خانای قوبادی»› ⊑ نمناک

**نمیناندن** / n(i)mînandin/: چاوگ. کردنه‌ بریکار ⊑ وکالت دادن

**نمینگه** / n(i)mînge/: ☜ **مزگه‌وت**

**نمینه** / n(i)mîne/: ☜ **نموونه**

**نمینه‌ک** / n(i)mînek/: ناو. نمانا؛ نمووچ؛ سه‌رمه‌شق ⊑ الگو؛ سرمشق

**نمینه‌نده** / n(i)mînende/: ☜ **نوێنه‌ر**

**نمێ** / n(i)mê/: ☜ **نوێژ**

**نمێژ** / n(i)mêj/: ☜ **نوێژ**

**نمێژکه‌ر** / n(i)mějker/: ☜ **نوێژخوێن**

**ننگ** / ning/: ناو. لاق؛ پا؛ لنگ؛ نگ ⊑ پا

**نو** / nu/: ☜ **نان**[2]

**نوا**[1] / n(i)wa/: ناو. ١. ئه‌نوا؛ شوێنێ که‌ باران نه‌یگرێته‌وه‌ ٢. ئه‌شکه‌وت؛ شکه‌فه‌ت؛ غار ٣. هه‌ر جار له‌ به‌فر بارین ‹ئه‌مشه‌و نوایه‌ک به‌فر باریوه›. ٤. پێشه‌وه‌؛ به‌رده‌م؛ پێش؛ لا و شوێنێ که‌ ده‌که‌وێته‌ به‌رده‌م بێژه‌ر، بیسه‌ر یان شتی ئاماژه‌پێ‌کراو ‹نوا لێ گرتن› ⊑ ١. پناهگاه از باران ٢. غار ٣. واحد شمارش دفعات بارش برف ۴. پیش؛ جلو

**نوا**[2]: ئاوه‌ڵکار. پێشه‌وه‌ ‹بچوه‌ نوا!› ⊑ پیش؛ جلو

**نوابڕ** / n(i)wabiř/: ئاوه‌ڵناو. لابڕ؛ سه‌ربڕ؛ قه‌دبڕ ⊑ میانبُر

**نوابه‌فر** / n(i)wabefir/: ناو. که‌ویلکه‌؛ به‌فرێ که‌ جێ ـ جێ توابێته‌وه‌ ⊑ برف جای ـ جای آب شده

**نواده** / n(i)wade/: ناو. ڕه‌گه‌ز؛ ڕه‌گه‌ما؛ بنچینه ⊑ نژاد

**نوار** / n(i)war/: ☜ **نوین**[1] ـ٢

**. نواڕ** / n(i)wař-/: پاشه‌وشه. ـ ڕوان ‹چاوه‌نواڕ› ⊑ ـ نگر

**نوارین** / n(i)wařîn/: چاوگ. نۆڕین؛ ڕوانین؛ نهێڕتن؛ نهێڕین؛ نه‌یڕین؛ نێڕتن؛ نێڕان؛ نێڕین؛ تماشا کردن ⊑ نگاه کردن؛ نگریستن

**نواکێش** / n(i)wakêş/: ناو. سه‌رگه‌له‌؛ ڕه‌مکێش؛ پێشه‌نگی گه‌له ⊑ پیشاهنگ؛ نخراز گله

**نوال** / n(i)wal/: ناو. نواڵ؛ نواڵه‌؛ نوهال؛ نوهێل؛ نهال؛ نه‌هال؛ نه‌واڵ؛ نێل؛ شیوه‌ڵه‌ی پچووک له‌ قه‌دی چیا ⊑ درّه‌ی کوچک در کمر کوه

**نواڵ** / n(i)wał/: ☜ **نوال**

**نواڵه** / n(i)wałe/: ناو. ١. ☜ **نوال** ٢. نزار له‌ کێودا؛ جێگه‌ی تاونه‌گر له‌ چیادا ٣. پڕی مشت له‌ دره‌وکراو ٤. ده‌سکێ له‌ گه‌لا و گیا ٥. بابۆڵه

هەویر کە ئەدرێ بە حەیوان بە تایبەتی وشتر ٦. نانی مفتی؛ ڕزقی بێ ئەرک 🇮🇷 ١. ☜ **نوال** ٢. جای سایه در کوه ٣. پُرِ مُشت از غلّه‌ی درویده ۴. یک دسته از گیاه و برگ ۵. نواله ۶ نان مجانی

⊡ **نواڵە کردن**: پێچانەوەی بابۆڵە و هەر شتێ 🇮🇷 نوردیدن

**ـ نوان** / -n(i)wan/: پاشەوشە. ـــ نما؛ شانـدەر ‹ئاوێنەی بالانوان› 🇮🇷 ـ نما؛ نشان‌دهنده

**نواندن** / n(i)wandin/: چاوگ. تێپەڕ. //نوانـدت؛ دەنوێنی؛ بنوێنە// ١. نوانن؛ شاندان؛ ڕانان ‹سەرم ناوێ کە فیزی بەگلەری و سەرداری بنوێنێ/ دەمم ناوێ کە تیکەی زل-زلی تەنهایی بگلێنێ «قانع»› ٢. دە خەو کردن؛ کردنە خەو؛ خەفاندن 🇮🇷 ١. نمایاندن ٢. خواباندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەنواندن

**نوانن** / n(i)wanin/: ☜ **نواندن ـ١**

**نوانە** / n(i)wane/: ناو. خشتە؛ گەلالەی خەتی بۆ دەربڕینی پێوەندی نێوان پاژگەلی گەلالەیەک 🇮🇷 نمودار

**نوانی** / n(i)wanî/: ناو. ١. ئەنوا؛ نوا؛ پەنا؛ پەسیو ٢. بزووت؛ جووڵە 🇮🇷 ١. پناهگاه ٢. حرکت

**نواوان** / n(i)wawan/: ناو. دەروازەوان؛ دەرکەوان؛ قاپیەوان 🇮🇷 دربان

**نوبار**[1] / nubar/: ☜ **نۆبار**

**نوبار**[2]: ئاوەڵناو. تازەساز و تەیار (کەوان) 🇮🇷 تازه ساخته و بی‌نقص (کمان)

**نوبلیوم** / nubilyum/: ناو. توخمی کیمیایی کانزایی ڕادیۆئەکتیڤ، لە دەستەی ئاکتنیدەکان بە ژمارەی ئەتومی ١٠٢، کە بە شێوەی دەسکرد بەرهەم دێ 🇮🇷 نوبلیم

**نوت**[1] / nu/: ناو. ١. ☜ **نۆتکە** ٢. نوتی مووسیقا 🇮🇷 ١. ☜ **نۆتکە** ٢. نُت موسیقی

**نوت**[2]: لێل. ← **نوت‌ونوێ**

**نوترون** / nutrun/: ناو. وردیلەی بناغەیی بێ‌بار، هاوسەنگی پروتون کە جگە لە هیدرۆژن-لە ناوکەی هەموو توخمەکاندا هەیە 🇮🇷 نوترون

**نوتق** / nutq/: ناو. ١. قسە؛ گوتە ‹کابرا لە ترسان هەر نوتقی نەما› ٢. قسە بۆ خەڵک کردن بە دەنگی بەرز ‹وەزیر هات نوتقی کرد› 🇮🇷 ١. سخن ٢. سخنرانی

**نوت‌ونوێ** / nut û n(i)wê/: ئاوەڵناو. زۆر تازە؛ تازە و نوێ ‹ئەم کراسە نوت‌ونوێیە بۆ نایکەیە بەرت؟› 🇮🇷 تازه و نو

**نوتەمین** / nutemîn/: ☜ **نەوەدەمین**

**نوچ**[1] / nuç/: ناو. ١. چەم؛ ڕەوتی چەمانەوە ٢. قەد؛ کاری بە سەر یەکا هێنانی کاغەز و پارچە و... ٣. ڕەت؛ تل؛ ساتمە ٤. سووچی لێفە و کەوا و... 🇮🇷 ١. خم ٢. تا ٣. سکندری ۴. گوشه‌ی لحاف و قبا و...

⊡ **نوچ بردن**: ☜ **نوچ دان**

**نوچ دان**: نوچ بردن؛ نوچکە بردن؛ نوچکە دان؛ ڕەت بردن؛ ساتمە کردن 🇮🇷 سکندری خوردن

**نوچ**[2]: ئاوەڵکار. [پلار] نە؛ نەخێر 🇮🇷 نه‌خیر

**نوچک** / nuç(i)k/: ناو. ١. ترۆپک؛ باریکایی سەری شت ‹سەر نوچکی دار؛ نوچکی چەقۆ› ٢. ☜ **نونجگ** 🇮🇷 ١. نوک بالایی هر چیز ٢. ☜ **نونجگ**

**نوچکە** / nuçke/: ناو. ڕەت؛ ساتمە؛ نوچ 🇮🇷 سکندری

⊡ **نوچکە بردن**: ☜ **نوچ دان**

**نوچکە دان**: ☜ **نوچ دان**

**نوچەش** / nuçeş/: ☜ **نوخوری**

**نوچێ** / nuçê/: ئاوەڵناو. تازە دروستکراو؛ تازەداهاتوو 🇮🇷 تازه‌ساز

**نوخ** / nux/: ئاوەڵناو. قەمبوور؛ پشتکوور؛ پشتچەماو 🇮🇷 کوژپشت

**نوخاع** / nuxa'/: ناو. دەزوولە؛ مرۆخە؛ مۆخی بڕبڕە

🇮🇷 نُخاع

**نوخـاف** / nuxaf/: نـاو. عـەفوو؛ کـاری بـوردن؛ بەخشین لە تاوان 🇮🇷 عفو؛ بخشایش

**نوخافتۆخ**[1] / nuxaftox/: ناو. *[کینایە]* خودێ؛ خودا؛ خوا 🇮🇷 خُدا

**نوخافتۆخ**[2]: ئاوەڵناو. دەهندە؛ بەخشندە 🇮🇷 بخشنده

**نوخافتۆر** / nuxaftor/: ئاوەڵناو. خۆگومکەر؛ خـۆدز لە فەرمان 🇮🇷 از زیر کار دررو

**نوخافتی** / nuxaftî/: ئاوەڵناو. بەخشراو؛ عـەفووکراو 🇮🇷 مغفور؛ بخشوده

**نوخان** / nuxan/: ☜ **نینۆک**

**نوختا** / nuxta/: ☜ **نوقتە**

**نوختک** / nuxtik/: ☜ **نوقتە**

**نوختکن** / nuxtkin/: ئاوەڵناو. نوختـەدار (پیـت) 🇮🇷 نقطه‌دار (حرف)

**نوختـە** / nuxte/: نـاو. ١. ☜ **نوقتـە** ٢. بنکـەی پولیسی ڕێوبان 🇮🇷 ١. ☜ **نوقتە** ٢. قرارگاه پلـیس راه

**نوختەوخاڵ** / nuxte w xał/: ناو. *[کینایە]* جوانکاری؛ کاری خەملاندن؛ خاڵ و مێل ڕشتن؛ کـاری خـۆ جوان کردن بە داودەرمان 🇮🇷 بزک؛ آرایش

**نوخسان** / nuxsan/: ☜ **نوقسان**

**نوخشانە** / nuxşane/: ☜ **نوخشە**

**نوخشە** / nuxşe/: ناو. نوخشانە: ١. دوابینی چاکـە و خراپە بۆ کەسانی تر «نوخشە بێ لە تـۆیش!» ٢. نۆبەرەی دەخڵ 🇮🇷 ١. پیش‌بینی آینده برای دیگـران ٢. نوبر غله

**نوخشەجار** / nuxşecar/: نـاو. یەکەمجار؛ دەحفەی ئەوەڵ 🇮🇷 اوّلین بار

**نوخوت** / nuxut/: ☜ **نۆک ـ١**

**نوخوری** / nuxurî/: ناو. ناخوری؛ نەخری؛ نوچەش؛ منالی نۆبەرە 🇮🇷 نخستین فرزند

**نوخوم** / nuxum/: ئاوەڵناو. داپۆشـراو؛ پۆشـیاگ 🇮🇷 پوشیده

**نوخومـان** / nuxuman/: چـاوگ. نوخـومین؛ داپۆشران؛ داپۆشیان 🇮🇷 پوشیده شدن

**نوخوماندن** / nuxumandin/: چـاوگ. داپۆشـین؛ سەرپۆش لە سەر دانان 🇮🇷 سرپوش گذاشتن

**نوخومین** / nuxumîn/: ☜ **نوخومان**

**نوخوەشەر** / nux(i)weşer/: ☜ **نوخۆشەر**

**نوخۆ** / nuxo/: ☜ **نۆک ـ١**

**نوخۆشەر** / nuxoşer/: نـاو. نخۆشـەر؛ نوخوەشـەر؛ نەخۆشـەر؛ نەخوەشـەر؛ نۆکەلەتـە؛ مقەشـەر؛ مەقەرشەر؛ ئارینۆک؛ ئـارێنۆک؛ ئـالینۆک؛ لەپـە؛ لاپە؛ لەتکەنۆک؛ نۆکەوردەی دووقـاش بـووی بـە ئاسیاو و دەسهاڕ، بۆ ناو خۆرشت و چێشت 🇮🇷 لپّه

**نوخون** / nuxûn/: ئاوەڵناو. نخوم؛ نخوون؛ نوگـوم؛ نووخن؛ نوون؛ نخون؛ بەراوەژوو؛ قلـپ 🇮🇷 نگـون؛ وارونه

⊡ **نوخـون بونـەوە**: ١. قلـب بوونـەوە ٢. *[مـەجاز]* دارایی و سامان نەمان 🇮🇷 ١. سـرنگون شـدن ٢. ورشکست شدن

**نوخە** / nuxe/: ☜ **نۆک ـ١**

**نـودەرار** / nuderar/: نـاو. *[کینایـە]* نـانپەیداکـەر؛ گەورەی ماڵ 🇮🇷 نان‌آور

**نوراشتن** / nuraştin/: چاوگ. دانووشـتاندن؛ قـەد کردن 🇮🇷 تا کردن

**نوراشتی** / nuraştî/: ئاوەڵناو. دانووشتاو؛ قەدکراو 🇮🇷 تاشده

**نوردو** / nurdû/: ☜ **نردو**

**نوردی** / nurdî/: ☜ **نردو**

**نورمتە** / nurmte/: ناو. واشە؛ باشـوو؛ باشـووکە 🇮🇷 چرغ؛ قرقی

**نوڕ** / nuř/: ئاوەڵناو. ١. بـەراوەژوو؛ سـەرەوخوار ٢. والا؛ پووک؛ ناوخالی 🇮🇷 ١. وارونه ٢. تُهی؛ توخالی

**نـوزاییش** / nuzayîş/: چـاوگ. نووزانـدن؛ دەنگـی

گریاناوی دەربڕین ☰ ناله و زاری کردن

**نوزدی** / nuzdî/: ☜ **نزیك**

**نوزڵه** / nuzłe/: ☜ **نزڵه**

**نوژ** / nuj/: ناو. سمین؛ کاری کون کردن بە مەتکەو ☰ عمل سُفتن؛ سوراخ کردن

**نوژتی** / nujtî/: ئاوەڵناو. سماو؛ کون کراو ☰ سُنبیده؛ سوراخ شده

**نوژوی** / nujwî/: ☜ **نیسك**[1]

**نوژوی** / nujûy/: ناو. نیسک؛ نژی ☰ عدس

**نوژی** / nujî/: ☜ **نیسك**[1]

**نوژیاو** / nujyaw/: ☜ **نیسکێن**

**نوست** / nust/: ☜ **نوشته ـ١**

**نوسخان** / nusxan/: ☜ **نوقسان**

**نوسخه** / nusxe/: ناو. ١. ڕاچێتە؛ ڕاسپاردەی نووسراوی پزیشک بۆ نەخۆش ٢. بەرگ؛ یەکەی ژماردنی نووسراوە ☰ ١و٢. نسخه

⊡ **نوسخه پێچان:** کۆ کردنەوە و ئامادە کردنی دەرمانەکانی ڕاچێتەی پزیشک ☰ نسخه پیچیدن

**نوسخه نوسین:** ڕاچێتە کردن؛ ڕاچێتە نووسین ☰ نسخه نوشتن

**نوسرەت** / nusret/: ناو. ئاریکاری لە خواوە ‹خوا نوسرەتی داین سەرکەوتین› ☰ نُصرت

**نوسک** / nusk/: ناو. پاڵ؛ دەلەک ☰ هُل

⊡ **نوسک دایش:** پاڵ پێوەنان؛ دەلەک دان ☰ هُل دادن

**نوسکاندن** / nuskandin/: چاوگ. لکاندن؛ پێوە نووساندن ☰ چسبانیدن

**نوسکانەوه** / nuskanewe/: چاوگ. نالینی زۆر بە سەبر ‹ئەو مناله ئەنوسکێتەوە، بزانە چییەتی!› ☰ نالیدن ضعیف

**نوسکه** / nuske/: ناو. نالەی سەبرۆکە لە لاوازی و بێتاقەتی ☰ نالەی ضعیف

**نوشتۆخ** / nuştox/: ☜ **نوسەر**

**نوشته** / nuşte/: ناو. ١. نووشتە؛ دۆعای نووسراو ٢. نووسراو؛ نووسیاگ ☰ ١. دعای نوشته شده ٢. نوشته

⊡ **نوشته نوسین:** دۆعا نووسین ‹هەر کە زانی مەلام، هەڵیپێچام نوشتەی بۆ بنووسم،کیژێک حەزی لێ بکا! «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ دُعا نوشتن

**نوشخور** / nuşxor/: ناو. نشخۆر؛ قەسەڵی ئاخوڕ؛ پاشاخۆڕ ☰ تەماندەی آخور

**نوشست** / nuşist/: ناو. شکست؛ شکس ☰ شکست

**نوشگڵ** / nuşgił/: ئاوەڵناو. چڵێس؛ زۆر چێ لە خواردن ☰ شکم پرست؛ چلاس

**نوشوس** / nuşus/: ☜ **نوشوست**

**نوشوست** / nuşust/: ناو. نوشوس؛ نشست؛ نشستی: ١. ڕەوتی شکانی قەدر و حورمەت ‹ئەوی بێگانەپەرستە، ئاخری نوشوستە «مەسەل»› ٢. خەسار و زیان لە ژیاندا ☰ ١. تنزل شخصیت و منزلت ٢. بدبیاری

⊡ **نوشوست پێهێنان:** لە قەدر خستن ☰ بی اعتبار کردن

**نوشوست هێنان:** ١. لە قەدر کەوتن ‹ئەوی ملهوڕ بێ نوشوست دێنێ و تێکدەشکێ› ٢. زیان کردن لە ژیانا ‹من بەم ماڵ فرۆشتنەم زۆرم نوشوست هێنا› ☰ ١. بی اعتبار شدن ٢. ضرر کردن

**نوغرۆ** / nuğro/: ☜ **نغرۆ**

**نوغم** / nuğm/: ☜ **نوقم ـ١**

**نوفت** / nuft/: ناو. کەپ؛ کەپۆ؛ بێڤل؛ لووت ☰ دماغ؛ بینی

**نوفوس** / nufûs/: ناو. ژمارەی ئاپۆرە ☰ نفوس

**نوڤاندن** / nuvandin/: چاوگ. ڕانان؛ نواندن؛ شاندان بە خەڵک ☰ نمایاندن؛ به نمایش گذاشتن

**نوڤەدان** / nuvedan/: ناو. ڕووداوی تازە 🇮🇷 رویداد تازە

**نوقتک** / nuqt(i)k/: ناو. تاو؛ قاس؛ دەم؛ ماوەیەکی کەم لە کات 🇮🇷 آن

◻ **نوقتکا پەیەن** کاتی ئاویلکە؛ قاسی گیانەلاو؛ دەمی دواهەناسە 🇮🇷 زمان نفس‌های آخر

**نوقتە** / nuqte/: ناو. نقتە؛ نوختا؛ نوختک؛ نوختە؛ خاڵ 🇮🇷 نقطە

**نوقرا** / nuqra/: ☜ نوقرە

**نوقرچک** / nuqirçik/: ☜ نوقورچك

**نوقرسک** / nuqirsik/: ☜ نوقورسك

**نوقرشک** / nuqirşik/: ☜ نوقورشك

**نوقرە** / nuqre/: ناو. نوقرا؛ زێو؛ زیو؛ زیڤ؛ تورمە: ١. توخمی کیمیایی کانزایی بە ژمارەی ئەتومی ٤٧ و کێشی ئەتومی ١٠٧,٨٦، سپی و بریقەدار، چەماندنی و چەکوشخۆر، تەنیا لە ناو ئەسید نیتریک و ئەسید سولفووریکی داخدا دەتوێتەوە. لە جەواهیرسازی، ددانبژیشکی، دەواسازی و وێنەگریدا کەلکی زۆرە ٢. بەرهەمی لە زێو چێ‌کراو 🇮🇷 ١و٢. نقرە

**نوقسان**[1] / nuqsan/: ناو. نقوستان؛ نوخسان؛ نوسخان؛ نوقستان؛ نوقوستان؛ نەقوستان؛ کەمایەسی؛ ناتەواوی 🇮🇷 نقص

**نوقسان**[2]: ئاوەڵناو. نقوستان؛ نوخسان؛ نوسخان؛ نوقستان؛ نوقوستان؛ نەقوستان: ١. سەقەت؛ سەکەت ٢. بێ‌هێز؛ بێ‌وزە ٣. لاواز؛ لەڕ ٤. کوێر؛ کۆر 🇮🇷 ١. ناقص‌العضو ٢. ناتوان ٣. لاغر ۴. کور؛ نابینا

**نوقستان** / nuqistan/: ☜ نوقسان

**نوقڤان** / nuqvan/: ناو. مەلەوانی بن گۆم 🇮🇷 غوّاص

**نوقڵ** / nuq(i)ł/: ناو. نقوڵ؛ نوقوڵ؛ نوقوڵ؛ شیرنیات؛ شەکرۆکە؛ شەکەرات 🇮🇷 نُقل

**نوقڵانە** / nuqłane/: ناو. ١. نوخشانەی باش ٢. مزگانی؛ شیرنی مژدەی خۆش 🇮🇷 ١. پیش‌بینی خوب ٢. مُژدگانی

**نوقڵەکوردی** / nuqłekurdî/: ناو. *[کینایە]* برێشکەی گەنمەشامی 🇮🇷 چُس‌فیل

**نوقڵی** / nuqłî/: ☜ نوقڵین

**نوقڵین** / nuqłîn/: ئاوەڵناو. نوقڵی: ١. شیرین و لەبەردڵان ٢. بچکۆلانە؛ بووچکەلانە 🇮🇷 ١. دوست‌داشتنی ٢. کوچولو

**نوقم** / nuq(i)m/: ئاوەڵناو. نگم: ١. نقم؛ نقوم؛ نقۆ؛ نقوو؛ نوغم؛ نوقوم؛ نەوق؛ ژێر ئاو یان تراوێ کەوتوو ٢. نخوون 🇮🇷 ١. غرق ٢. نگون

◻ **نوقم بوون** ١. ژێر ئاو کەوتن ٢. *[کینایە]* بێ‌سەروشوێن چوون 🇮🇷 ١. غرق شدن ٢. مفقودالاثر شدن

**نوقم بوونەوە** نخوون بوونەوە؛ قلپ بوونەوە 🇮🇷 سرنگون شدن

**نوقم کردن** ١. بردنە ژێر ئاو و ون کردن ‹گێژاو لوولی دا، شەپۆل نوقمی کرد/ خورێنی چۆمی کەلاکیشی برد «هێمن»› ٢. ون کردن؛ تەفر و توونا خستن 🇮🇷 ١. غرق و ناپدید کردن ٢. گُم کردن

**نوقمەسار** / nuqmesar/: ئاوەڵناو. نگمەسار: ١. سەرنخوون ٢. ون؛ بێ‌سەروشوێن ٣. نوقم؛ ژێر ئاو یان تراوێک کەوتوو ‹بلا با نوقمەساری توونی قووڵی ڕەنج و مەینەت بم/ جیهانێ دێتە نالین یەک زەمان گەر بەندە پەیدا بم «تاهیر هاشمی»› 🇮🇷 ١. نگونسار ٢. ناپدید ٣. غرق شدە

**نوقوچاندن** / nuquçandin/: ☜ نوقورچك گرتن

**نوقورچ** / nuqurç/: ☜ نوقورچك

**نوقورچک** / nuqurçik/: ناو. ناقورچ؛ ناقولچ؛ نقوچ؛ نقوچ؛ نقورچ؛ نقورچک؛ نقووچ؛ نکوچک؛ نوقورچ؛ نوقرچک؛ نوکورتە؛ قورنچ؛ نەقوس؛ نەقوسکی؛ گفشک؛ چینچینک؛ قولینجێ؛ کورچی؛

قورینجان؛ کورنیشک؛ کونجرک؛ کاری گرتن و گوشار دانی پاژێک له پێستی لەش بە دوو قامک ☰ نیشگون

⊡ **نوقورچک گرتن**: نوقوچاندن؛ گوشار دانی پاژێک له پێست به دوو قامک ☰ نیشگون گرفتن

**نوقورچکانه** / nuqurçkane/: ناو. قورنج بۆ گاڵته له کەسێ که جلکی تازەی دەبەر کردووه ☰ نیشگون به شوخی

**نوقورسک** / nuqurs(i)k/: ناو. نوقرسک؛ چۆرت؛ خەونووچکه؛ تەکانی سەر، له بەر خەو هاتن ☰ چُرت؛ پینکی

**نوقورشک** / nuqurşik/: ناو. نوقرشک؛ بیرەخەو؛ خەوەنووچکه؛ وەنەوز ☰ چُرت

**نوقوستان** / nuqustan/: ☜ **نوقسان**

**نوقول** / nuqul/: ناو. ۱. قول؛ کون ۲. ☜ **نوقڵ** ☰ ۱. سوراخ ۲. ☜ **نوقڵ**

**نوقولاندن** / nuqulandin/: چاوگ. کون کردن ☰ سوراخ کردن

**نوقوڵ** / nuquł/: ☜ **نوقڵ**

**نوقوم** / nuqum/: ☜ **نوقم ـ۱**

**نوکته** / nukte/: ناو. نکته: ۱. حەنەک؛ قسەی پێکەنینی ۲. خاڵ؛ بابەتی روون و زەق ‹کەس نییه لەم نوکته حاڵیم کا وەفایی! دڵبەرم/ خۆی دەمی هێنا، ئەمن گەستم، دڵی بابی شکا! «وەفایی»› ۳. قسەی بە تێکوڵ و خۆش ‹هەر نوکته لەبۆ ئێوه کەوا بێته بەیانم/ شەرحێکی لەتیفە، بە پڕوپووچی مەزانە! «ناری»› ☰ ۱. جُک؛ لطیفه ۲و۳. نُکته

**نوکتەباز** / nuktebaz/: ناوەڵناو. نکتەبێژ؛ حەنەکچی گاڵتەچی؛ قسەسەیر؛ قسەخۆش. هەروەها: **نوکتەبازی** ☰ بذلەگو

**نوکر** / nukr/: ناو. کەندەکاری لە بەرد و دار ☰ حَک

**نوکراندن** / nukrandin/: چاوگ. ۱. کەندن له دار و بەرد ۲. بیراز کردن؛ نۆژەن کردنی بەرداش ‹بەرێ ئیشێ مه نوکراند› ☰ ۱. حک کردن بر سنگ و چوب ۲. زبر کردن سنگ آسیاب ساییده

**نوکروسک** / nukrusk/: ناو. وێژنگی زل ☰ دهن‌درّه

**نوکل** / nukl/: ☜ **نکل**

**نوکم** / nukm/: ☜ **ناکاو**

**نوکوچ** / nukuç/: ناوەڵناو. خل؛ خلی؛ خڕ؛ بووچک به قالب ☰ کوچکتر از قالب

⊡ **نوکوچ کردن**: خلەخل کردن؛ خڕەخڕ کردن ☰ لق ـ لق کردن

**نوکوچەک** / nukuçek/: ناوەڵناو. خلەخل‌کەر؛ خڕەخڕکەر ☰ لق ـ لق‌زن

**نوکورته** / nukurte/: ناو. ۱. ئەسپابی له دار کەندن ۲. ☜ **نوقورچك** ☰ ۱. ابزار کنده‌کاری بر چوب ۲. ☜ **نوقورچك**

**نوکول**[۱] / nukûl/: ☜ **نکل**

**نوکول**[۲]: ☜ **نکول**

**نوکولی** / nukûlî/: ☜ **نکولی**

**نوگوم** / nugum/: ☜ **نوخون**

**نوگوهان** / nuguhan/: ناو. بەرکەڵ؛ نێنگوون؛ نوێنگین؛ مانگای سێ‌ساڵان ☰ تلیسه

**نول** / nul/: ☜ **نۆل**

**ـ نوما** / -numa/: پاشەوشه. ـنما؛ پیشاندەر ‹قیبلەنوما› ☰ ـ نما؛ نمایانگر

**نومبەچۆ** / numbeço/: ☜ **نافەك**

**نومتش** / numtiş/: چاوگ. وەشاردن؛ شاردنەوه ☰ پنهان کردن

**نومهەد** / numhed/: ناو. کەوشەن؛ سنوور ☰ مرز

**نونجک** / nuncik/: ☜ **نونجگ**

**نونگ** / nung/: ناو. شوێن؛ شۆپ ☰ اثر؛ رد

**نونگه** / nunge/: ناو. سۆراغ؛ سۆسه ☰ سرنخ از خبر

**نونو** / nunû/: ناوەڵناو. تازەتازه؛ زۆر تازه ☰ بسیار

تازە

**نووازە** / nuwaze/: ناو. *[ئایین]* پەرجۆ؛ پەرجوو؛ پەرژوو؛ پەرهێن؛ موجزات؛ کاری زۆر سەیر و سەمەرە کە لە پێغەمبەرانەوە بینراوە و نیشاندەری دەستڕۆشتوویی هێزی ئاسمانی لە ژیانی مرۆڤە ☰ مُعجزه

**نووەڕ** / nuweř/: ناو. تووک؛ نفرە ☰ نفرین

**نوە**[1] / n(i)we/: ☜ **نۆرە**

**نوە**[2]: ☜ **نوێ**

**نوەڕ** / n(i)weř/: ناو. تووک؛ دوعای شەڕ؛ نزای خراپ ☰ نفرین

**نوەگوان** / n(i)weg(i)wan/: ناو. نێنگوین؛ مانگای بەرکەڵ؛ چێڵی سێ ساڵان ☰ تلیسه؛ ماده گاو سه ساله

**نوەن** / n(i)wen/: ☜ **نۆبەن**

**نوەی** / n(i)wey/: ☜ **نۆك ـ١**

**نوە** / nuh/: ☜ **نوها**

**نوها** / nuha/: ناو/ ئاوەڵکار. نوه؛ نوهۆ؛ نۆکا؛ نۆکە؛ نووکە؛ نها؛ نەکای؛ نەوکە؛ نەوە؛ نهۆ؛ نهە؛ نەها؛ نەهە؛ ئێستا؛ ئێستێ ☰ اکنون

**نوهاڵ** / nuhal/: ☜ **نواڵ**

**نوهانی** / nuhanî/: ئاوەڵناو. تازەکار؛ هێشتا ڕانەهاتوو لە کار ☰ ناشی

**نوهت** / nuht/: ناو. خەفتان؛ دەغڵی درەنگ چێنراو ☰ بذر دیر کاشته شده

**نوهتن** / nuhtin/: چاوگ. سمین؛ کون کردن بە مەتکەو یا درێشە ☰ سُنبیدن؛ سوراخ کردن

**نوهتی** / nuhtî/: ئاوەڵناو. سماو؛ کونکراو ☰ سوراخ‌شده

**نوهژەن** / nuhjen/: ☜ **نۆژەن**

**نوهگوان** / nuhg(i)wan/: ناو. بەرکەڵ؛ دامنەچەقان؛ چێڵی سێ بەهار دیتوو ☰ تلیسه

**نوهلیک** / nuhlîk/: ☜ **نالی**

**نوهۆ**[1] / nuho/: ☜ **نۆك ـ١**

**نوهۆ**[2]: ☜ **نوها**

**نوهۆم** / nuhom/: ☜ **نهۆم**

⊡ **نوهۆم هێنان**: زگ دانی دیوار و ... ‹دیواری حەوشە نوهۆمی هێناوە› ☰ شکم دادن دیوار و ...

**نوهونە** / nuhûne/: ناو. ١. خانووی نۆ؛ ماڵ تازە ٢. ☜ **نۆماڵ** ☰ ١. خانەی نو ٢. ☜ **نۆماڵ**

**نوهی** / nuhî/: ناو. تازەیی؛ نوێیەتی ☰ تازگی

**نوهین** / nuhîn/: ئاوەڵناو. تازە؛ نفتونەوە ☰ نوین

**نوهێل** / nuhêl/: ☜ **نواڵ**

**نوی** / n(i)wî/: ☜ **نەوی**

**نویچە**/ n(i)wîçe/: ناو. هەواڵ؛ خەوەر؛ دەنگ‌وباس ☰ خبر

**نویرە** / n(i)wîre/: ناو. خوەرە؛ نەخۆشی گولی ☰ جُذام

**نویسان** / n(i)wîsan/: چاوگ. نووسین؛ نڤیسین ☰ نوشتن

**نویستەی** / n(i)wîstey/: چاوگ. نووسین ☰ نوشتن

**نویسەی** / n(i)wîsey/: چاوگ. نووسین ☰ نوشتن

**نویسیار** / n(i)wîsyar/: ☜ **نڤیسیار**

**نویشک** / n(i)wîşk/: ناو. نڤشک؛ نڤیشک؛ نیڤشک؛ کەرە؛ ڕۆنەکەرە؛ ڕۆنی هێشتا قاڵ‌نەکراو ☰ کره

**نویلک** / n(i)wîlik/: ناو. سەرانگوێلک؛ سەریوان ☰ سرگینگاه

**نوین** / n(i)wîn/: ☜ **نوێن**[1]

**نوێ** / n(i)wê/: ئاوەڵناو. ناوۆ؛ نوە؛ نوو؛ نووڤ؛ نەو؛ نۆ؛ نی؛ نووی؛ نەوا؛ تازە ‹بەرگی نوێ؛ ساڵی نوێ› ☰ تازە؛ نو

⊡ **نوێ کردنەوە**: نوێ کرن: ١. کۆن تازە کردنەوە ٢. لە سەرڕا دەست پێ‌کردنەوە ‹شەڕەکەی نوێ کردەوە› ☰ ١. تازه کردن ٢. از سر گرفتن

**نوێ کرن**: ☜ **نوێ کردنەوە**

**نوێخوازی** / n(i)wêx(i)wazî/: ناو. نۆخوازی؛

نوێوازی: ١. لایەنگری لە شێوە و ڕێبازی تازەی هونەری و وێژەیی ٢. لایەنگری لە شێوازی فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی نوێ. هەروەها: **نوێخواز** ▪ ١و٢. نوگرایی

**نوێرد** / n(i)wêrd/: ناو. باقیە؛ تەقەڵی درشت ▪ بخیه

**نوێردە** / n(i)wêrde/: ناو. کاری قەراغ دادروونی لێواری لیباس ▪ عمل کنارەی جامه را تا کردن و دوختن

**نوێرنایەوە** / n(i)wêrnayewe/: چاوگ. نووشتاندنەوە ▪ خم کردن

**نوێریایەوە** / n(i)wêryayewe/: چاوگ. نووشترانەوە ▪ خم شدن

**نوێژ** / n(i)wêj/: ناو. *[ئیسلام]* نڤێژ؛ نما؛ نماز؛ نمێ؛ نمێژ؛ نۆژ؛ نەماج؛ نەماژ؛ نێژ؛ نیمە؛ مێژ؛ عیبادەتێکی ئایینی موسوڵمانان بۆ ڕاز و نیاز لەگەڵ خوادا بە خوێندنی حەمد و سوورە و چەند دۆعای‌تر هاوڕێ لەگەڵ ڕاوەستان و چوونە ڕکوع و سوجدەدا ▪ نماز

▣ **نوێژی ئایات** *[ئیسلام]* نوێژێکی تایبەت لە کاتی ڕووداوە نائاساییەکانی سروشت (وەک: بوومەلەرزە و مانگ و خۆرگیران) ▪ نماز آیات

**نوێژی باران**: نوێژی بە کۆمەڵ لە کاتی وشکەساڵ و مەترسی قڕ و قاتیدا بۆ داوای باران لە خودا ▪ نماز استسقا

**نوێژی تەراویح** *[ئیسلام]* نوێژی سوننەت تایبەت بە شەوانی مانگی ڕەمەزان ▪ نماز تراویح

**نوێژی جومعە** *[ئیسلام]* نوێژی هەینی؛ نوێژی بە کۆمەڵی ڕۆژی هەینی کە خەڵک لە شوێنێکی شار یان گونددا دەیخوێنن ▪ نماز جمعه

**نوێژی جەژن** *[ئیسلام]* نوێژی بە کۆمەڵ لە ڕۆژانی جێژنی قوربان و ڕەمەزاندا ▪ نماز عید

**نوێژی جەماعەت** *[ئیسلام]* نوێژی بە کۆمەڵ لە پشتەسەری پێشنوێژەوە ▪ نماز جماعت

**نوێژی خەوتنان** *[ئیسلام]* نوێژ عیشا؛ نوێژی ئاخری شەو کە چوار ڕکاتە ▪ نماز عشا

**نوێژی شێوان** *[ئیسلام]* نوێژی ئێوارە؛ نوێژی مەغریب کە سێ ڕکاتە ▪ نماز مغرب

**نوێژی مردوو** *[ئیسلام]* نوێژێ کە بۆ مردووی موسوڵمان، زۆرتر پێش ناشتنی، دەخوێنرێ ▪ نماز میت

▣ **نوێژ بوون** *[ئیسلام]* کاتی نوێژ گەیشتن ‹بروانە بزانە نوێژ بووە؟› ▪ وقت نماز آمدن

**نوێژ بە قەزا گێڕانەوە**: ☜ **نوێژ گێڕانەوە**

**نوێژ چواندن** *[ئیسلام]* نوێژ دە وەختی خۆیدا بەجێ نەهێنان ▪ نماز را به موقع نخواندن

**نوێژ چوون** *[ئیسلام]* دەمی نوێژ فەوتان ▪ وقت نماز گذشتن

**نوێژ خوێندن**: ☜ **نوێژ کردن**

**نوێژ دابەستن** *[ئیسلام]* ڕاوەستان و دەست بە نوێژ خوێندن کردن ▪ اقامەی نماز کردن

**نوێژ قەزا کردن/ کردنەوە**: ☜ **نوێژ گێڕانەوە**

**نوێژ کردن** *[ئیسلام]* نۆژ کرن؛ نوێژ خوێندن؛ نوێژ بەجێ هێنان ▪ نماز گزاردن

**نوێژ گێڕانەوە** *[ئیسلام]* نوێژ بە قەزا گێڕانەوە؛ نوێژ قەزا کردن/ کردنەوە؛ نوێژی چوو لە کاتێکی‌تردا خوێندنەوە ▪ نماز گذشته را قضا کردن

**نوێژ لە سەر نەبوون** *[ئیسلام]* ١. لەش پیس بوون ٢. نابالغ و کەم‌تەمەن بوون ▪ ١. جنب بودن ٢. نابالغ بودن

**لە نوێژ بردن** *[کینایە]* پیس کردن ▪ کثیف کردن

**لە نوێژ چوون** *[کینایە]* پیس بوون ▪ کثیف شدن

**نوێژان** / n(i)wêjan/: ناو. *[کینایە]* بەر لەخۆر کەوتن ▪ قبل از طلوع آفتاب

**نوێژخانە** / n(i)wêjxane/: ☜ **نوێژگە ـ١**

**نوێژخــوێن** / n(i)wêjx(i)wên/: نــاو. *[ئیســلام]* نمێژکەر؛ نڤـێژکەر؛ نوێژکـەر؛ کەسـێ کـە نـوێژ بەجێ دێنێ ☰ نمازگزار

**نوێژدان** / n(i)wêjdan/: ☜ **مزگەوت**

**نوێژقــایم** / n(i)wêjqayim/: ئاوەڵــناو. *[ئیســلام]* تایبەتمەندی کەسێ کە وەک دەڵـێن: «سـەری بچێ، نوێژی ناچێ»! ☰ همیشه نمازخوان

**نوێژکەر** / n(i)wêjker/: ☜ **نوێژخوێن**

**نوێژکەهاڵ** / n(i)wějkehał/: ئاوەڵناو. حشکەنمێژ؛ کەمنوێژ ☰ سهل‌انگار در نماز خواندن

**نوێژگـە** / n(i)wêjge/: نـاو. *[ئیسلام]* ١. نوێژخانــە؛ ژوور یان شوێنی نوێژ خوێندن ٢. ☜ **مزگـەوت** ☰ ١. نمازخانه ٢. ☜ **مزگەوت**

**نوێژورۆژوپـاک** / n(i)wêj û řojûpak/: ئاوەڵـناو. *[مەجاز]* زۆر بە دین و موسوڵمانی چاک ☰ مُتدین

**نوێژەبارانــە** / n(i)wêjebarane/: نــاو. *[ئیســلام]* نڤێژابارانی؛ نوێژەبارانێ؛ نوێژی بە کۆمەڵ لە کاتی وشکەساڵ و مەترسی قڕ و قاتیدا بـۆ داوای بـاران لە خودا ☰ نماز باران

**نوێژەبارانێ** / n(i)wêjebaranê/: ☜ **نوێژەبارانە**

**نوێژی** / n(i)wêjî/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* پـاک و خـاوێن ‹جلەکانم نوێژین؛ ئەم بەڕەیە نوێژییـە› ☰ پـاکیزه و شایان نماز

⊡ **نوێژی بـون:** خاوێن بوون و بـۆ نـوێژ شـیان ☰ پاکیزه و شایان بودن برای نماز

**نوێژیان** / n(i)wêjyan/: ناو. *[کینایە]* نـوێژان؛ کـاتی بەر لە خۆر کەوتن ☰ زمان قبل از طلوع آفتاب

**نوێساز** / n(i)wěsaz/: ئاوەڵناو. تازەساز؛ نۆسـاز ☰ نوساز

**نوێشـک** / n(i)wêşk/: نـاو. شـــیلاوک؛ ژیلـــک؛ ئامێژەن؛ ئامیانی پەنیر ☰ پنیرمایەی حیوانی

**نوێگن** / n(i)wêgin/: ☜ **نوێن**[1]**ـ٢**

**نوێگوان** / n(i)wêg(i)wan/: ☜ **نوێن**[1]**ـ٢**

**نوێڵ** / n(i)wêł/: ناو. نێڵ؛ باری؛ لۆسـە؛ مەڵـغە ☰ اهرم

⊡ **نوێڵ دان:** بە لۆسە بزواندن ☰ بـا اهـرم حرکـت دادن

**نوێمانگ** / n(i)wêmang/: ناو. سەری مانگی تـازە ☰ اوّل ماه

**نـوێن**[1] / n(i)wên/: نـاو. نــێن؛ نــوین: ١. نڤــین؛ کەل‌وپەلی خەو ‹بـابی هـێمن گـوتی: بـەو شـەوە چارەی نوێن چۆن بکەین؟ گـوتم: ئیجـازە بـدە مـن دەیکەم، تۆ بچۆرەوە ماڵ! «هەژار، چێشتی مجێـور»› ٢. نوار؛ نوێگن؛ نوێگوان؛ نوێنگـوون؛ نوێنگـووین؛ نـوێنگین؛ نووینــک؛ نـۆگن؛ نـۆگین؛ نــەهگۆن؛ نـەوژن؛ نـەوژەن؛ نۆهگـوان؛ نۆهگـۆن؛ نیڤـگۆن؛ نێنگوین؛ نیـنگین؛ نێنگـوون؛ بەرکـەڵ؛ مانگـای سـێ‌سـالان ☰ ١. رختخـواب ٢. تلیسـە؛ مـاده گـاو سەساله

**نوێن**[2]: ئاوەڵناو. نێن؛ تازە؛ نوێ ☰ نو

**ـ نوێن**[3]: پاشەوشە. ـ نێن؛ بنوێن ‹بالانوێن› ☰ ـ نما

**نوێنباز** / n(i)wěnbaz/: نـاو. وەینــەک؛ کۆسـەی سەرشانۆ ☰ بازیگر

**نوێنـک** / n(i)wênik/: نـاو. نووینـــک؛ نـــەینک؛ نـەینۆک؛ نـەینووک؛ ئاوێنـە؛ گـوزگی؛ قودیـک؛ عەینک ☰ آیینه

**نوێنگوون** / n(i)wêngûn/: ☜ **نوێن**[1]**ـ٢**

**نوێنگووین** / n(i)wêngûyn/: ☜ **نوێن**[1]**ـ٢**

**نوێنگین** / n(i)wêngîn/: ☜ **نوێن**[1]**ـ٢**

**نوێنەمـەک** / n(i)wê n(i)mek/: نـاو. نیوەنمــەک؛ نیمەنمەک؛ هەویری تێرخوێ کـراوی ئامـادە بـۆ سەر برین و کوتراوی ☰ خمیر نمک ویژەی زخـم و ضرب‌دیدگی

**نوێنە** / n(i)wêne/: ☜ **نوێنەر**

**نوێنەر**[1] / n(i)wêner/: نـاو. نمینەندە؛ نوێنە؛ نۆنەر؛ نوونەر؛ نووینە؛ نیوەر: ١. ئـەو کەسـە لـە لایـەن

دەستە، تاقم یان کۆمەڵێکەوە بۆ بەشداری لە کۆڕ، ئەنجومەن یان لێژنەیەک هەڵدەبژێردرێ تا دەمڕاست و پارێزەری بەرژەوەندی وان بێ ‹نوێنەری کوردان خان و ئاغایە/ باسی ئازادیی لە لا کا و بایە! «قانع»› ٢. بریکار؛ جێدار؛ نەوەنگە؛ بەندەر؛ بەرکەیە؛ ئەو کەسەی لە لایەن کەس یان دامەزراوەیەکەوە بۆ خزمەت بە خۆیان هەڵدەبژێردرێ ‹نوێنەری بازرگانی› ٣. نیشاندەر؛ ناسێنەر 🇮🇷 ١و٢. نماینده ٣. نمودار

**نوێنەر**[٢]: ئاوەڵناو. نمینەندە؛ نوێنە؛ نۆنەر؛ نوونەر؛ نووینە؛ نیوەر: ١. تایبەتمەندی شتێ کە مرۆ دە خەو کا ٢. بە تایبەتمەندی نواندنەوە 🇮🇷 ١. خواب‌آور ٢. نمایشگر

**نوێنەرایەتی** / n(i)wênerayetî/: ☜ **نوێنەری**

**نوێنەری** / n(i)wênerî/: ناو. نوێنەرایەتی؛ بریکاری: ١. کار و پیشەی نوێنەری پەرلەمان ٢. کاری جێبەجێ کردنی ئەرکێ بە نوێنەرایەتی چەن کەس یا تاقمێکەوە 🇮🇷 ١و٢. نمایندگی

**نوێنەک** / n(i)wĕnek/: ئاوەڵناو. نموونە 🇮🇷 نمونه

**نوێوازی** / n(i)wĕwazî/: ☜ **نوێخوازی**

**نوێیەتی** / n(i)wĕyetî/: ☜ **نوهی**

**نۆ**[١] / no/: ناو. ١. نۆو؛ نەه؛ ژمارەی سەرەکی پێش دە و پاش هەشت ٢. نە؛ نا؛ وەرامی نەرێنی ٣. تام‌تیژی ٤. گیای تیژتام ٥. ☜ **نان**[٢] 🇮🇷 ١. عدد نُه ٢. نه؛ خیر ٣. تُندمزگی ٤. گیاه تُندمزه ٥. ☜ **نان**[٢]

**نۆ**[٢]: ئاوەڵناو. ١. یەکێک زۆرتر لە هەشت ٢. تازە؛ نۆ؛ نوێ ٣. دڕ و شەڕانی ‹سەگی نۆ› ٤. هار و هاج و بزۆر 🇮🇷 ١. نُه ٢. تازه؛ نو ٣. درنده ٤. بازیگوش

▣ **نۆ بوون**: دڕ بوون (سەگ) ‹سەگی وە نۆ بوویە› 🇮🇷 درنده شدن (سگ)

**نۆ**[٣]: ئاوەڵکار. نە؛ نا 🇮🇷 نه؛ خیر

**نۆ**[٤]: جێناو. ئەمە؛ ئەم شتە 🇮🇷 این

**نۆ-**[٥]: پێشوشە. ١. خاوەن تازەیی ‹نۆبەهار؛ نۆجەژن› ٢. تازەساز؛ تازەداهاتوو ‹نۆماڵ؛ نۆبەرە؛ نۆزین؛ نۆبووک› ٣. خاوەن نۆ ژمارە ‹نۆڕیز› 🇮🇷 ١و٢. تازه ٣. نُه-

**نۆب** / nob/: ☜ **نۆرە**

**نۆبار** / nobar/: ناو. نوبار؛ تازەبەهار؛ سەرەبەهار؛ سەرەتای بەهار 🇮🇷 نوبهار

**نۆبانێ** / nobanê/: ناو. کاری نۆبە کردن لە کارێکدا 🇮🇷 عمل نوبت گرفتن در کار

**نۆباوە** / nobawe/: ئاوەڵناو. فانتێزی؛ تازەباو 🇮🇷 فانتزی

**نۆبووک** / nobûk/: ناو. نووبویک؛ تازەوەوی؛ تازەبووک؛ بوویکا نوو؛ بووکی تازە ‹بۆ وەی کە لە دیدەتا نەبم سووک/ ڕازامەوە بۆت لە چەشنی نۆبووک «هەژار، *مەم و زین*»› 🇮🇷 تازه‌عروس

**نۆبە** / nobe/: ناو. ١. ☜ **نۆرە** ٢. کێشک؛ پاس 🇮🇷 ١. ☜ نۆره ٢. کشیک

**نۆبەبڕ** / nobebiř/: ☜ **نۆرەبڕ**

**نۆبەبڕی** / nobeb(i)ři/: ☜ **نۆرەبڕی**

**نۆبەت** / nobet/: ناو. ١. ☜ **نۆرە** ٢. کێشک؛ پاس 🇮🇷 ١. ☜ نۆره ٢. کشیک

▣ **نۆبەت دان**: ☜ **نۆرە دان**

**نۆبەت گرتن**: ☜ **نۆرە گرتن**

**نۆبەتی** / nobetî/: ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. بە نۆبە 🇮🇷 نوبتی

**نۆبەتیدار** / nobetîdar/: ئاوەڵناو. تادار؛ یاوکردگ 🇮🇷 تبدار

**نۆبەتێ** / nobetê/: ناو. تاولەرز؛ یاو و لەرزی یەک لە دووی یەک 🇮🇷 تب نوبتی

**نۆبەتێدار** / nobetêdar/: ئاوەڵناو. نەخۆشێ کە تای لێ دێت 🇮🇷 تب‌دار

**نۆبەچی** / nobeçî/: ناو. ئێشکگر؛ کێشکچی 🇮🇷 نگهبان

**نۆبەخت** / nobext/: ناوەڵناو. ١. داواکراو؛ خوازبێنی لێوەکراو ٢. *[کینایە]* تازەکیسە؛ تایبەتمەندی کەسێ کە لە ڕووتییەوە دەوڵەمەند بووبێ لێ نەزانێ ≡ ١. خواستگاری شده ٢. نوکیسه

**نۆبەخش** / nobexş/: ناو. چاوپۆشی لە تاوانبارێ کە یەکەم جاری بووە ‹برۆ ئەمە نۆبەخشت بێ! ئیتر خراپە نەکەی!› ≡ بخشش گناهکار بی سابقه

**نۆبەدار**[1] / nobedar/: ناو. کێشکچی؛ پاسدار ≡ نگهبان

**نۆبەدار**[2]: ناوەڵناو. نۆبەگەیشتوو؛ خاوەن نۆرە ≡ نوبت رسیده

**نۆبەر** / nober/: ناو. نۆبەرە؛ خیوە؛ خیفە؛ خیڤە؛ خیف؛ باڵاتە؛ ناخوری؛ نخری؛ تانە؛ تەسق؛ تەسوق؛ تەروەندە؛ مەڕخێفە: ١. میوەی زووڕەس ٢. میوەیێ کە لە سەرەتای وەرزی خۆیدا دێتە بازاڕ ≡ ١و٢. نوبر

**نۆبەرە** / nobere/: ناو. ١. ☞ **نۆبەر** ٢. نخری؛ نخوری؛ ئێکەم فرزەند ≡ ١. ☞ **نۆبەر** ٢. نخستین فرزند

⊡ **نۆبەرە کردن**: ئێکەم جار خواردنی میوەی گەیشتوو ‹هێشتا هەنارم نۆبەرە نەکردووە› ≡ خوردن میوەی نوبر

**نۆبەن** / noben/: ناو. نومن؛ نۆبەند؛ نۆکەڵ؛ نۆگەن؛ نۆومن؛ جوانەگای سێساڵە کە تاز دەخرێتە بەر نیر ≡ گاو نر سه ساله

**نۆبەند** / nobend/: ☞ **نۆبەن**

**نۆبەهار** / nobehar/: ناو. نۆبار؛ تازەبەهار؛ سەرەبەهار؛ نۆوەهار؛ سەرەتای وەرزی بەهار ‹بنوارە نۆبەهار و فوتووحاتی گوڵشەنی/ گوڵ زاری کردەوە، لە دەمی، غونچە پێکەنی «نالی»› ≡ نوبهار

**نۆپێچکە** / nopêçke/: ناوەڵناو. تازە پێ گرتوو (منداڵ) ≡ نوپا

**نۆت** / not/: ناو. ١. ☞ **نەوەد** ٢. نوت؛ ئەلفوبێتکەی مووسیقا ≡ ١. ☞ **نەوەد** ٢. نُت

**نۆتر** / notir/: ناو. نۆترڤان؛ پاسدار ≡ پاسدار

**نۆترسی** / notirsî/: ناو. *[دەروونناسی]* ترس لە شتی تازە و نۆ ≡ نوهراسی

**نۆترڤان** / notirvan/: ☞ **نۆتر**

**نۆتک** / notik/: ناو. ١. توێڵ؛ ئەنی؛ ناوچاوان ٢. دەنکی ناو میوە ٣. ☞ **نۆتکە** ≡ ١. پیشانی ٢. هستەی میوە ٣. ☞ **نۆتکە**

**نۆتکە** / notke/: ناو. نوت؛ نۆتک؛ نۆتلک؛ میتولکە؛ ڕشک؛ میتوولە؛ مێتوولکە؛ بێچووی وردی ئەسپێ ≡ تخم شپش

**نۆتل** / notil/: ئامراز. وەکی؛ لە وێنەی؛ لە گوێن ≡ مانندِ؛ شبیهِ

**نۆتلک** / notlik/: ☞ **نۆتکە**

**نۆتنە** / notne/: ناو. گەرا؛ تۆمی ماسی و مێروو ≡ تخم ماهی و حشرات

**نۆتە** / note/: ☞ **نیاتە**

⊡ **نۆتە کردن**: ☞ **نیاتە کردن**

**نۆتەکەر** / noteker/: ☞ **نیاتەکار**

**نۆتەم** / notem/: ☞ **نەوەدەم**

**نۆتی** / notî/: ☞ **نەوەد**

**نۆجوان** / noc(i)wan/: ناوەڵناو. نەوجوان؛ تازەلاو؛ تازە سەردەمی منداڵی تێپەڕ کردوو ‹لەوانە دوو لاوی برا و زۆر نۆجوان و جوانچاک بوون کە شێخ زۆری خۆشدەویستن «هەژار، چێشتی مجێور»›. هەروەها: **نۆجوانی** ≡ نوجوان

**نۆجەژن** / nocejn/: ناو. ١. سەرساڵی بیرەوەری مردوو ٢. هەوەڵ جەژنی دوای مردنی خۆشەویستان ≡ ١. سالمرگ ٢. نوعید

**نۆجەوان** / nocewan/: ناو. تازەلاو؛ تازەجەوان. هەروەها: **نۆجەوانی** ≡ نوجوان

**نۆچە** / noçe/: ناو. ١. نۆجوان؛ تازەلاو ٢. نۆبەرەی تووتن ٣. بەردەست؛ شاگرد ≡ ١. نوجوان ٢.

توتون تازه رسیده ۳. نوچه

**نۆچەیی** / noçeyî/: ناو. تازەلاوی؛ لاوکی ⊠ نوجوانی

**نۆحە** / noĥe/: ناو. سەردولکە؛ سەردولکان؛ چەمەری ⊠ نوحه

**نۆخان** / noxan/: ☜ نینۆك

**نۆخوازی** / nox(i)wazî/: ☜ نوێخوازی

**نۆد** / nod/: ☜ نەوەد

**نۆددان** / nod(i)dan/: ناوەڵناو. تایبەتمەندی کەس یان ئاژەڵێ کە تازە ددانی دەرهاتبێ ⊠ نودندان

**نۆدەمین** / nodemîn/: ☜ نەوەدەمین

**نۆدەهەمین** / nodehemîn/: ☜ نەوەدەمین

**نۆدین** / nodîn/: ☜ نۆموسوڵمان

**نۆدێ** / nodê/: ناو. تازە گوند؛ گوندی تازە ئاوەدان‌کراو ⊠ روستای نوبنیاد

**نۆر** / nor/: ☜ نۆرە

**نۆردو** / nordu/: ☜ نردو

**نۆردۆر** / nordor/: ناو. دۆرمادار؛ دەوراندەور ⊠ پیرامون

**نۆردوو** / nordû/: ☜ نردو

**نۆردی** / nordî/: ☜ نردو

**نۆرە** / nore/: ناو. نوە؛ نۆب؛ نۆبە؛ نۆبەت؛ نۆر؛ نۆگە؛ نەوە؛ نەوب؛ نەوبە؛ نەوەتە: ١. کات یان ماوەیەکی تەرخان‌کراو بۆ هەر یەک لە ئەندامانی کۆمەڵەیەک بۆ ئەنجامدانی کارێ یان وەرگرتنی ڕاژەیەک ‹لە درەو نەجات نۆرەی خەرمانە/ گاگێرە بێنن کلۆش کوتانە «قانع»› ٢. جار؛ ڕا؛ کەرەت؛ دەحە ‹ڕۆژێ سێ نۆرە نان ئەخۆین› ⊠ ١و٢. نوبت

▣ **نۆرە/ نۆگەناو**: نۆبەتی ئاودێری ⊠ نوبت آبیاری

**نۆرە/ نۆگەڕان**: نۆبەتی شوانی ⊠ نوبت چوپانی

▣ **نۆرە/ نۆگە دان**: نۆبەت دان ⊠ نوبت دادن

**نۆرە گرتن**: نۆبە گرتن: ١. بۆ نۆبە چاوەڕوان بوون ٢. ئێشک گرتن ⊠ ١. نوبت گرفتن ٢. نگهبانی دادن

**نۆرەی کەسێک بون**: ماف یان ئەرکی کەسێک بوون بۆ ئەنجام دان یان جێبەجێ کردنی کارێکی دیاریکراو ‹نۆرەی منە نان بسێنم› ⊠ نوبت کسی بودن

**نۆرەی کەسێک فەوتان/ چون**: بە سەر چوونی ماوەی دیاریکراو بۆ کەسێک ‹درەنگ هاتن، نۆرەکەتان چوو› ⊠ نوبت کسی گذشتن

**نۆرەبڕ** / norebiř/: ناوەڵناو. نۆبەبڕ؛ گوێنەدەر بە نۆرە ⊠ بی اعتنا به نوبت

**نۆرەبڕی** / noreb(i)řî/: ناو. نۆبەبڕی؛ نۆگەبڕکێ؛ کاری پێشێل کردنی نۆرەی خەڵک ⊠ عمل رعایت نکردن نوبت

**نۆرەکار** / norekar/: ناو. شیفت ⊠ شیفت

**نۆرەکاری** / norekarî/: ناو. کارێ کە بە پێی ماوەیەکی دیاریکراو، نۆرەی دەگۆڕێت ⊠ نوبتی

**نۆرەگر** / noregir/: ناو. گیوەگیر ⊠ نوبت‌گیر

**نۆرەگری** / noreg(i)rî/: ناو. گیوەگیرە ⊠ نوبت‌گیری

• **نۆڕ** / -noř/: پاشەوشە. ـ نواڕ ‹چاوەنۆڕ› ⊠ ـ نگر

**نۆڕسک** / nořisk/: ناو. دیاردە؛ ڕووداو؛ تازەسەرهەڵداو ⊠ پدیده

**نۆڕسکێن** / nořiskên/: ناو. یارییەکە وێنەی دامە، هەر یاریکەرێ نۆ داشی پێیە ⊠ نوعی بازی شبیه داما

**نۆڕە** / noře/: ناو. کاری ڕوانین بە چاوی زەقەوە ⊠ نگاه خیره

**نۆڕەس** / nořes/: ناوەڵناو. تازەپێگەیشتوو ⊠ نورس

**نۆڕیزکێن** / nořîzkên/: ناو. نۆڕیزکێنە؛ زچێن؛ گەمەیەکە بە چەو ئەکرێ ⊠ نوعی بازی با شن

**نۆڕیزکێنە** / nořîzkêne/: ☜ نۆڕیزکێن

**نۆڕین** / nořîn/: ☜ نواڕین

**نۆز** / noz/: ناوەلکار. دیسان؛ دیسانەوە؛ سەرلەنوێ

🇮🇷 از نو

**نـۆزده**[1] / nozde/: ناو. نـووزده؛ نەویـەس؛ نـەوێس؛ ژمارەی سەرەکی پاش هەژدە و پێش بیسـت 🇮🇷 عدد نوزده

**نـۆزده**[2]: ئاوەڵـناو. نـووزده؛ نەویــەس؛ نــەوێس: ١. دانەیێ زیاتر لە هـەژدە دانـە ٢. نۆزدەهـەم 🇮🇷 ١. نوزده ٢. نوزدهم

**نۆزدەمی** / nozdemî/: ☜ **نۆزدەهەمی**

**نۆزدەمین** / nozdemîn/: ☜ **نۆزدەهەمین**

**نۆزدەهم** / nozdehem/: ☜ **نۆزدەهەم**

**نۆزدەهـەک** / nozdehek/: نـاو. لــە نــۆزده بــەش بەشێک 🇮🇷 یک نوزدهم

**نۆزدەهــەم** / nozdehem/: ئاوەڵــناو. نــۆزدەهی؛ نۆزدەهم؛ لە جێگا و پلەی نۆزدەدا 🇮🇷 نوزدهم

**نۆزدەهــەمی** / nozdehemî/: جێنــاو. نـــۆزدەمی؛ ئەوەی کە لە ڕیز یان جێگـای نۆزدەهەمدایـە 🇮🇷 نوزدهمین

**نۆزدەهەمین** / nozdehemîn/: ئاوەڵناو. نـۆزدەمین؛ لە جێگا و پلەی نۆزدەهەمدا 🇮🇷 نوزدهمین

**نۆزدەهی** / nozdehî/: ☜ **نۆزدەهەم**

**نۆزکە** / noz(i)ke/: ☜ **نۆزگە**

**نۆزگـە** / noz(i)ge/: نـاو. نۆزکـە؛ نۆسـکە؛ نۆڵـەم؛ نخری؛ نخوری؛ زارۆی نۆبەرە 🇮🇷 نخستین فرزند

**نـۆزین** / nozîn/: ئاوەڵــناو. نـــووزین؛ تـــازەگیراو (جوانوو) 🇮🇷 تازه رام شده (کُرّه اسب)

**نۆژ** / noj/: نـاو. ١. گەنەی پەز ٢. ☜ **نـویژ** 🇮🇷 ١. کنەی گوسفندان ٢. ☜ **نویژ**

⊡ **نۆژ کرن:** ☜ **نویژ کردن**

**نۆژدار** / nojdar/: ناو. دەرمانی کـاری بـۆ چـارەی دەرد 🇮🇷 نوشدارو

**نۆژەن**[1] / nojen/: نـاو. نوهژەن؛ نـووژەن: ١. کـار و ڕەوتی چاک کردنـەوە ٢. گوندەڵبەسـت؛ کـار و ڕەوتی ئاوەدان کردنـەوە؛ نـوێ کردنـەوە ‹نـۆژەن کردنــەوەی قوتابخانــەکان›✱ هــەروەها: **نـۆژەن کردنەوە** 🇮🇷 ١. تعمیر ٢. نوسازی

**نۆژەن**[2]: ئاوەڵکار. نوهژەن؛ نـووژەن؛ نـۆز؛ دیسـان؛ سەرلەنوێ 🇮🇷 از نو

**نۆساز** / nosaz/: ئاوەڵناو. تازەساز؛ نوێساز 🇮🇷 نوساز

**نۆستالژی** / nostaljî/: نـاو. ١. مـەراق؛ تامـەزرۆیی زۆر و لەڕادەبەدەر بـە گەڕانـەوە بـۆ شـوێن یـان سەردەمێکی بگاردە کە تازە نایەتـەوە ٢. دەردی غـەریبی؛ خـەم و ئـازاری دووری لـە نیشـتمان، بنەماڵە و دۆستان 🇮🇷 ١و٢. نُستالژی

**نۆسکە** / nos(i)ke/: ☜ **نۆزگە**

**نـۆش**[1] / noş/: ئاوەڵناو. گـوارا؛ لـە گیـان خـۆش 🇮🇷 گوارا

⊡ **نۆش کردن:** فڕ کردن؛ ڤەخارن 🇮🇷 نوشیدن

**نۆشی گیان بـوون:** لە گیان خۆش هاتنی خواردن و ڤەخارن 🇮🇷 نوش جان شدن

**نۆش**[2]: سارستە. نۆشی گیانت بێ 🇮🇷 نوش جان

**نـۆش**[3]: پاشەوشـە. ـــ خـۆر؛ ئـەوەی دەخواتــەوە ‹بادەنۆش› 🇮🇷 ـ نوش

**نۆشاتر** / noşatir/: ☜ **نۆشادر**

**نۆشادر** / noşadir/: ناو. نۆشاتر؛ نەوشاتر؛ خوێیەکی سپی، بێبـۆن و تیـژە لـە ئـاودا دەتوێتـەوە و بـۆ دەرمان دەشێ 🇮🇷 نُشادر

**نۆشان** / noşan/: ☜ **نۆشین**

**نۆشاندن** / noşandin/: چاوگ. دەرخوارد دانی تراو 🇮🇷 نوشاندن

**نۆشـای** / noşay/: چاوگ. نۆشان ‹سوراحی لەبڕێـز ساغەر ئامادەن/ وەخت نۆشای مەین خاتران شـادەن «سەیدی»› 🇮🇷 نوشیدن

**نۆشدارو** / noşdarû/: نـاو. دەرمانی تـراو 🇮🇷 داروی مایع

**نۆشنای** / noşnay/: چاوگ. نۆشاندن 🇮🇷 نوشاندن

**ـ نۆشـی** / noşî-/: پاشەوشـە. کـاری خواردنــەوە

‹بادەنۆشی› ـ نوشی

**نۆشین / noşîn/**: چاوگ. تێپەڕ. //نۆشـیت؛ دەنۆشـی؛ بنۆشە// نۆشان؛ ڤـەخارن؛ فـڕ کـردن ‹حـەیاتا دل مەیا باقی بنۆشین دا ب موشتاقی «مەلای جزیری»› نوشیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەنۆشین

**نۆغڵ / noğił/**: ناو. شەکەرات؛ نوقڵ نُقل

**نۆف / nof/**: ناو. ١. جۆرێ پالاى سووک ٢. پینەی پالا ١. نوعی پای‌افزار سبک ٢. پینەی پای‌افزار

**نۆڤەر / nover/**: جێناو. ئەم لایە؛ ئەم تەرەفە این طرف

**نۆق[1] / noq/**: ناو. ١. خالیگە؛ کەلەکە ٢. کەمبـەر؛ کەمەر ١. پهلو ٢. کمر

**نۆق[2]**: ئاوەڵـناو. ١. قـووڵ؛ نـق ٢. نقـوم؛ نخـڕۆ؛ نوقمەسار ١. عمیق ٢. غرق

**نۆقار / noqar/**: ناو. ١. هەر گیاندارێ کە لـە بـن ئاودا دەڕوا ٢. ژێردەریایی ١. هر جانوری که زیر آب حرکت کند ٢. زیردریایی

**نۆقاندن / noqandin/**: چـاوگ. دەبـن تراوێـک کردن؛ خستنە ژێر تراوێکەوە غوطەور کردن

**نۆقزراڤ / noqz(i)rav/**: ئاوەڵـناو. بـەژن‌باریـک؛ قەدباریک کمرباریک

**نۆقە / noqe/**: نـاو. وشـتری مێوینـە؛ دەوەهـێ مێنگە شتر مادە

**نۆک / nok/**: ناو. نووک: ١. نخـۆ؛ نخـە؛ نوخـوت؛ نوخۆ؛ نوخـە؛ نـوەی؛ نوهـۆ؛ نۆهـک؛ نهـا؛ نـەها؛ نـەهک؛ نەهـە؛ نووخـە؛ هـۆک؛ ڕووەکێکـی یەک‌ساڵەیە بە گەڵای شانەیی کوڵـکن و گوڵـی ئەرخـەوانی تـاک و دانی ئـەو گیایـە کـە دانەوێڵـەیەکی پچـووکی بـە دندووکـە و بـۆ زۆر چێشتان دەبێ، هەروەها لـە دەسـتاڕ دەکـرێ و نخۆشەری لێ بەرهـەم دێ ٢. سـەری باریـک و تیژی هەر شتێ ١. نخود ٢. نُک

▣ **نـۆکێ کەسـک** شـۆقل؛ پۆڵـکە؛ گـاگۆز نخودفرنگی

**نۆکا[1] / noka/**: ☜ **نوها**

**نۆکا[2]**: ئاوەڵکار. ١. ☜ **نوها** ٢. ئەوسا؛ ئەوجارە ١. ☜ **نوها** ٢. آنگاه

**نۆکاو / nokaw/**: ناو. نخاو؛ شۆرباوی نـۆک آش نخود

**نۆکڵ / nokił/**: ئاوەڵـناو. تـازە لـە کـڵ دەرهـاتوو (دەفری لە سواڵـەتی یـان شیشـە) تـازە از کـورە درآمدە

**نۆکۆم / nokom/**: ئاوەڵـکار. ناکـاو؛ کـوت‌وپـڕ ناگهان

**نۆکە / noke/**: ☜ **نوها**

**نۆکەچەرمو / nokeçermû/**: ☜ **نۆکەسپی**

**نۆکەچەرمەڵە / nokeçermełe/**: ☜ **نۆکەسپی**

**نۆکەحۆڵە / nokeĥole/**: ناو. نۆکی درشت نخود دُرُشت

**نۆکەر / noker/**: ناو. نووکـەر؛ خزمـەتکار؛ خـولام؛ پاکوڕە؛ ئیرمان؛ مەستەر؛ هژمە؛ ئایم؛ خزمـەتچی؛ هەشمـەت ‹نۆکـەر و پێشـخزمەت و کارەکـەر و دایانەکـەت/ کەوتـە ڕۆژی خـۆی بزانـە دوژمـنی خوێنینتە «قانع»› نوکر

**نۆکەراتی / nokeratî/**: ☜ **نۆکەری**

**نۆکەرایەتی / nokerayetî/**: ☜ **نۆکەری**

**نۆکەرباب / nokerbab/**: ناو. سەرنۆکەر؛ باب‌نۆکەر؛ گەورە نۆکەری ئاغا و خانان بزرگ نوکر

**نۆکەری / nokerî/**: نـاو. نۆکـەراتی؛ نۆکەرایـەتی؛ خولامی؛ خزمەتکاری؛ هژمەکاری: ١. گۆڕیـایش؛ کاری نۆکەر ‹حەزی لـە نۆکـەری ئـەم و ئـەوە› ٢. دۆخ یان چۆنیەتی نۆکەر بوون ١و٢. نوکری

**نۆکەڕەشکە / nokeřeşke/**: نـاو. نۆکەڕەشە؛ جـۆرێ نۆک کە ڕەنگی ڕەشە نخود سیاه

**نۆکەڕەشە / nokeřeşe/**: ☜ **نەهەی سیا**

**نۆکەزۆردە** / nokezorde/: ناو. فەریکەنۆک ▦ نخود دلمل

**نۆکەسپی** / noke(i)spî/: ناو. نۆکەچەرموو؛ نۆکەچەرمەڵە؛ نۆکەسپیکە؛ نۆکەسپیلکە ▦ نخود سفید

**نۆکەسپیکە** / nokes(i)pîke/: ☜ **نۆکەسپی**

**نۆکەسپیلکە** / nokespîlke/: ☜ **نۆکەسپی**

**نۆکەسورکە** / nokesûrke/: ☜ **نۆکەسوورە**

**نۆکەسوورە** / nokesûre/: ناو. نۆکەسوورکە؛ نووکەسوورکە؛ ئەو نۆکەی لەپەی لێ دروست دەکەن ▦ نخود لپه

**نۆکەشوانە** / nokeş(i)wane/: ناو. نۆلەکە؛ نۆکەکێویلە کە ڕەنگی ڕەشە ▦ نوعی نخود وحشی سیاه رنگ

**نۆکەقەزوێن** / nokeqezwên/: ناو. جۆرێ نۆکی دەنک گەورەیە ▦ نوعی نخود

**نۆکەکێویلە** / nokekêwîle/: ناو. گیایەکی خۆرسکە لە نۆک دەچێ ▦ گیاهی است

**نۆکەلەتە** / nokelete/: ☜ **نوخۆشەر**

**نۆکەڵ** / nokeł/: ☜ **نۆبەن**

**نۆکەن** / noken/: ناو. نۆکەند؛ شەقەجۆگەی زل بۆ تێکەلاو کردنەوەی ئاوی دوو سەرچاوەی لێک دوور ▦ کانال

**نۆکەند** / nokend/: ☜ **نۆکەن**

**نۆکیسە** / nokîse/: ئاوەڵناو. ١. *[پلار]* تازە پێدا کەوتو؛ نۆبەخت؛ تازەکیسە؛ دیتۆک؛ دەولەمەن‌چلکن؛ لە کوت‌وپڕا دەولەمەندبووی لێ‌نەزان ٢. *[کینایە]* ڕژد ▦ ١. نوکیسه ٢. خسیس

**نۆگن** / nogin/: ☜ **نوێن[١]-٢**

**نۆگە** / noge/: ناو. ١. ☜ **نۆرە** ٢. تای ڕۆژنارۆژە ٣. گەمە و دەسبازی ▦ ١. ☜ **نۆرە** ٢. تب نوبه ٣. شوخی و دست‌بازی

**نۆگەبڕکێ** / nogebiřkê/: ☜ **نۆرەبڕی**

**نۆگەچی** / nogeçî/: ناو. نۆبەدار؛ ئێشکگر ▦ پاسدار؛ نگهبان

**نۆگەن** / nogen/: ☜ **نۆبەن**

**نۆگها** / nog(i)ha/: ناو. تازەجەوان؛ تازەلاو؛ جحێڵ ▦ نوجوان

**نۆگین** / nogîn/: ☜ **نوێن[١]-٢**

**نۆل** / nol/: ناو. نول؛ ئاکار؛ ڕەوش؛ کردە ▦ کردار

**نۆلا** / nola/: ئامراز. چەشنی؛ وەکی؛ چون؛ وەکوو ▦ مانندِ؛ مثلِ

**نۆلانی** / nolanî/: ناو. چون‌یەکی؛ چۆنیەتی لێک چوون ▦ شباهت

**نۆلەکە** / noleke/: ناو. نۆکەشوانە؛ نۆکەکێویلە کە ڕەنگی ڕەشە ▦ نوعی نخود وحشی سیاه رنگ

**نۆلەم** / nolem/: ☜ **نۆزگە**

**نۆڵ** / noł/: پێرۆ. ← **نفت‌ونۆڵ**

**نۆما** / noma/: ناو. جوانوو ئەسپی دوو ساڵە ▦ کُرّه اسب دو ساله

**نۆماڵ** / nomał/: ئاوەڵناو. نوهوونە: ١. تازە ژن و ماڵ پێکەوەناو ٢. تازە لە ئاواییدا نیشتەجێ‌بوو ▦ ١. تازه مُتأهل شده ٢. تازه در آبادی ساکن شده

**نۆماڵی** / nomałî/: ناو. کەلپەلی پێکەوە نراو بۆ نۆماڵ ▦ اسباب و اثاثیّه‌ی فراهم شده برای شروع زندگی

**نۆمانگ** / nomang/: ئاوەڵناو. پاوەمانگ؛ پابەمانگ؛ سەرحاملیە ▦ پابه‌ماه

**نۆمانگی** / nomangî/: ناو. جۆرێ گرکەی شوێن ـ شوێنە، پێستێکی ڕەقی هەیە، ئەگەر نۆ مانگیش داینێن هیچی لێ نایە ▦ نوعی گرمک

**نۆمدار** / nomdar/: ☜ **نێودار**

**نۆمس** / nomis/: ئاوەڵناو. تازەکار؛ ناشی؛ نامامیەد؛ تازە فێرەکار ▦ نوآموز

**نۆمسلمان** / nomisiłman/: ☜ **نۆموسوڵمان**

**نۆمسڵمان** / nom(i)siłman/: ☜ **نۆموسوڵمان**

**نۆموسوڵمان / nomusułman**/: ئاوەڵناو. نۆمسڵمان؛ نۆمسلمان؛ نۆدین ☰ نومسلمان

**نۆمە / nome**/: ☜ نیو-١

**نۆمەتش / nometiş**/: چاوگ. لار کردنەوە؛ خوار کردنەوە ☰ کج کردن

**نۆمینە / nomîne**/: ناو. ١. ڕۆژی عارەفە؛ ڕۆژێ بەر لە جێژنی قوربان ٢. مانگی قوربان ☰ ١. نُهم ذیحجه؛ روز عرفه ٢. ماه ذیحجه

▣ **نۆمینەی حاجیان**: نۆ ڕۆژی پێش جێژنی قوربان کە بۆ قەزای ڕەمەزان ڕۆژوو دەگرن ☰ نُه روز نخست ماه ذی‌الحجه

**نۆن / non**/: ناو. نان؛ نانە ☰ نان

**نۆنگە / nonge**/: ئاوەڵناو. دڵخۆش ☰ سرحال؛ دلخوش

**نۆنۆ / nono**/: ناو. *[منداڵانە]* نۆنە؛ دانوولە؛ دانوو؛ دانەوێڵەی کوڵاو ☰ حبوبات آب‌پز

**نۆنۆڵە / nonołe**/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی زەلامێ کە ئاکاری منداڵانە دەکا ☰ ویژگی بزرگی که ادای بچه‌ها را در می‌آورد

**نۆنە / none**/: ☜ نۆنۆ

**نۆنەر / noner**/: ☜ نوێنەر

**نۆنەڵ / noneł**/: ئاوەڵناو. گردەڵی وریا ☰ قدکوتاه زرنگ

**نۆنەمام / nonemam**/: ناو. نەونەمام: ١. بنتا؛ بنتاو؛ بنچڵ؛ خەڵفی تازەی یەکساڵە ٢. *[مەجاز]* تازە پێگەیشتووی لەبار ☰ ١. نونهال ٢. تازه‌جوان

**نۆنەوار / nonewar**/: ☜ نك‌ونوار

**نۆو / now**/: ☜ نۆ[1]-١

**نۆوە / nowe**/: ☜ نۆرە

**نۆوەن / nowen**/: ☜ نۆبەن

**نۆوەهار / nowehar**/: ☜ نۆبەهار

**نۆویژان / nowîjan**/: ناو. بۆژانە؛ بووژانە ☰ بومادران

**نۆهاتی / nohatî**/: ئاوەڵناو. تازەداهاتوو ☰ تازه مُد شده

**نۆهک / nohik**/: ☜ نۆك -١

**نۆهگوان / nohg(i)wan**/: ☜ نوێن[1]-٢

**نۆهگۆن / nohgon**/: ☜ نوێن[1]-٢

**نۆهەت / nohet**/: ☜ نەوەد

**نۆهەم / nohem**/: ناو. نۆیەم؛ نها؛ نەون؛ نەها؛ نەهەم؛ خێوی ڕیز و جێگای نۆ ☰ نهم

**نۆهەمین / nohemîn**/: ئاوەڵناو. نۆیەمین؛ نەهەمین؛ خێوی ڕیز و جێگای نۆهەم ☰ نهمین

**نۆهەوار[1] / nohewar**/: ناو. تازە ئێلاخ؛ شوێنی نوێ لە زۆزان ☰ ییلاق نوین

**نۆهەوار[2]**: ئاوەڵناو. تازە هاتوو بە زۆزانان ☰ تازه به ییلاق آمده

**نۆهێلکە / nohêlke**/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی مریشکێ کە تازە هاتبێتە سەر هێلکە کردن ☰ تازه تخمگذار (مُرغ)

**نۆین / noyn**/: ناو. گۆنجە؛ گۆنگە ☰ تنبوشه

**نۆیەک / noyek**/: ناو. لە نۆ پاژ پاژێک ☰ یک‌نُهم

**نۆیەم / noyem**/: ☜ نۆهەم

**نۆیەمین / noyemîn**/: ☜ نۆهەمین

**نۆیی / noyî**/: ناو. دڕی؛ شەڕفرۆشی ☰ ستیزه‌جویی

**نۆیین / noyîn**/: ناو. دوژمنایەتی ☰ دشمنی

**نو[1] / nû**/: ئاوەڵناو. ١. ☜ نوێ ٢. نە؛ نا؛ نۆ؛ نەو؛ نەی؛ نێ؛ نیشانەی وەرامی پێچەوانە ☰ ١. ☜ نوێ ٢. نه

**نو[2]**: ئاوەڵکار. نە؛ نا؛ نەی؛ نێ؛ پێچەوانەی ئا ‹ـ تە دچی ماڵا مە؟ ـ نوو› ☰ نه

**نو[3]**: ئامراز. یان؛ ئان؛ یا خۆ ☰ یاخود

**نوبویک / nûb(i)wîk**/: ☜ نۆبوك

**نوپاڵو / nûpałû**/: ناو. دووبڕ؛ جاشێ کە تازە بار دەکرێ؛ کەرێ کە پێی ناوەتە سێ ساڵەوە ☰ کُره‌خر سه ساله

**نوپژی / nûp(i)jî**/: ☜ نیسك[1]

**نوتەک / nûtek/**: ئاوەڵناو. تنۆک؛ تاریکای خەست ‹دنیا تاریک و نووتەک بوو، چم نەدی و لە چاڵەکە کەوتم› ☰ ظلمات؛ تاریکی شدید

**نوچاندن / nûçandin/**: ☜ **نوقاندن**

**نوچانەوە / nûçanewe/**: چاوگ. ١. چەمانەوە ٢. قەد کران؛ لا بە سەر یەکا هاتن ☰ ١. خم شدن ٢. تا شدن

**نوچنایۆ / nûçnayo/**: چاوگ. نووشتاندنەوە ☰ خم کردن

**نوچە / nûçe/**: ناو. دەنگ‌وباس؛ هەواڵ ☰ خبر

**نوچیان / nûçyan/**: چاوگ. ١. چەمانەوە ٢. دانووشتان ☰ ١. خم شدن ٢. تا شدن

**نوچیانەوە / nûçyanewe/**: چاوگ. ١. نووچیان؛ چەمانەوە ٢. ڕەت بردن و کەوتن ☰ ١. خم شدن ٢. سکندری خوردن

**نوچیایۆ / nûçyayo/**: چاوگ. نووشتانەوە؛ چەمانەوە ☰ خم شدن

**نوخان**[1] **/ nûxan/**: چاوگ. نخوون بوون؛ قلپ بوون ☰ سرنگون شدن

**نوخان**[2]: ناو. ناخوون؛ ناخوێن؛ نینۆک ☰ ناخُن

**نوخانبڕ / nûxanbiř/**: ☜ **نینۆکبڕ**

**نوخانگیر / nûxangîr/**: ☜ **نینۆکبڕ**

**نوخانن / nûxanin/**: چاوگ. نووخاننەوە؛ نخوون کردن ☰ سرنگون کردن

**نوخاننەوە / nûxannewe/**: ☜ **نوخانن**

**نوخن / nûxin/**: ☜ **نوخون**

**نوخە / nûxe/**: ☜ **نۆك ـ١**

**نوخەن / nûxen/**: ☜ **نینۆك**

**نور / nûr/**: ناو. تیشک؛ تریسک؛ تیژک؛ نیر؛ شۆق؛ شەوق؛ شەبەق: ١. ڕۆشنایی؛ ڕووناکی؛ پرشنگێ کە دەبێتە هۆی دەرکەوتن و بینینی شت ‹لە چینی پەرچەما نووری جەبینی دی، وتی زاهید/ کە سووتا دامی تەزویرم بە نووری دامی تەنویرت «مەحوی»› ٢. *[فیزیک]* پرشنگی ئەلکترۆمیغناتیسی لە شەبەنگی ژێرسوور تا ژوور بنەوش و تیشکی ئیکس کە بە خێرایی ٣٠٠٠٠٠ کیلۆمیتر لە چرکەدا تێدەپەڕێ ٣. ڕادەی درەوشانەوە ‹ئەم چرایە نووری نییە› ٤. کونی گەورە و ئەشکەوتاسای ناو کەژ کە بەرە خوار دەڕوا ☰ ١تا٣. نور ۴. غار به سمت اعماق در کوه

**نورانی / nûraranî/**: ئاوەڵناو. ١. شۆقدار؛ پرشۆق؛ پرشنگدار ٢. *[کینایە]* بەفەڕ؛ بەودم ‹قەت پیرێژنی هێندە نوورانی و دڵسۆز بە کوردم نەدیوە «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ ١و٢. نورانی

**نورباران / nûrbaran/**: ئاوەڵناو. نووروواران؛ تیشکباران: ١. زۆر ڕووناک ‹دەشت لە تیشکی مانگ نووربااران بوو› ٢. نوورپرشێنی؛ بە تیشکدانەوەی زۆر و زەبەند لە چەن لاوە ‹شاریان نوورباران کرد› ☰ ١و٢. نورباران

**نورپرشێنی / nûpirşênî/**: ☜ **نورباران ـ٢**

**نورپژێن / nûp(i)jên/**: ئاوەڵناو. شۆقدەر؛ نوورانی ☰ نورانی

**نورسەگ / nûrseg/**: ☜ **نوسەکە**

**نورواران / nûrwaran/**: ☜ **نورباران**

**نور و نەشەمە / nûr û neşeme/**: ناو. *[کینایە]* ودم؛ پێ و قەدەم؛ نوور و نێوچاوان ☰ یُمن

**نورونێوچاوان پاك / nûr û nêw çawan pak/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* پاک و بەشەرەف ☰ پاک و شریف

**نورە / nûre/**: ناو. ١. ئاگرپژێن؛ گڕکان ٢. نەورە؛ واجبی ☰ ١. آتشفشان ٢. واجبی

**نوڕە / nûře/**: دەنگەناو. ١. زۆڕە؛ گریان بە دەنگی زبر و ناخۆش ٢. هاواری سەگ ☰ ١. گریه با صدای گوشخراش ٢. زوزەی سگ

**نوز**[1] **/ nûz/**: دەنگەناو. دەنگی باریکی گریاناوی ☰ صدای نازک همراه با گریه

**نوز**[2]: پێرۆ. ← **نازونوز**

**نووزا** / nûza/: ☞ **نەوزاد**

**نووزاک** / nûzak/: ☞ **نەوزاد**

**نووزاندن** / nûzandin/: چاوگ. تێنەپەر. //نووزانـدت؛ دەنـووزێنی؛ بنووزێنـە// نـووزانن: ١. نووزەنـووز کردن؛ دەنگی گریاناوی دەربـڕین ٢. دەنگـدانی سەگ کاتێک خاوەنەکەی دەبینـێ و دەچـێ بـۆ لای ☰ ١. گریه و لابه کردن ٢. صدا درآوردن سـگ وقتی که صاحبش نزدیک می‌شود

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەنووزاندن

**نووزانـەوە** / nûzanewe/: چـاوگ. تێنەپـەر. //نووزایەوە؛ دەنووزێیەوە؛ بنووزێـوە// کرووزانـەوە ☰ گریه و لابه کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەنووزانەوە

**نووزدە** / nûzde/: ☞ **نۆزدە**

**نووزن** / nûzin/: ئاوەڵـناو. بیـانووگر؛ بیانـک‌گـیر ☰ بهانه‌جو؛ بهانه‌گیر

**نـووزنای** / nûznay/: چـاوگ. نووزەنـووز کـردن ☰ گریه و زاری کردن

**نووزنـوز** / nûznûz/: دەنگـەناو. قرووسکەقرووسـک ☰ زوزەی پیاپی

**نووزە** / nûze/: دەنگـەناو. دەنگی گریانی لەسـەرخۆ ‹ئیتر یاخوا نەسـیبی دوشمنـت بـێ/ بـڕینی نێـزە و نووزەی بریندار «شێخ ڕەزا»› ☰ مویه

⊡ **نووزە بڕین**: ١. [پلار] بێـدەنگ کـردنی کەسـی گریـاو ٢. [کینایـە، پـلار] هەناسـە نەهێشـتن؛ خنکاندن و کوشـتن ☰ ١. خـاموش کـردن آدم گریان ٢. خفه کردن

**نووزەدرێژ** / nûzed(i)rêj/: ئاوەڵناو. [پلار] چەنەبازی چەقەکەر ☰ رودەدراز

**نووزەڵ** / nûzeł/: ☞ **نوکن**

**نـووزەنـوز**[١] / nûzenûz/: دەنگـەناو. گریـان بـە سەبرۆکە ☰ مویه

**نووزەنوز**[٢]: دەنگ. فەرمان بە بەس کردن لە نـووزە ‹توخوا نووزەنووز!› ☰ امر به تمام کردن گریه

**نووزەنووزکەر** / nûzenûker/: ئاوەڵناو. جـووکن؛ بـە پرتە و بۆڵە ☰ وزوزو

**نـووزیای** / nûzyay/: چاوگ. نووزە لێ هەسـتان ☰ زاری کردن

**نـووزین**[١] / nûzîn/: چاوگ. نووزاندن ☰ گریه و لابـه کردن

**نووزین**[٢]: ☞ **نۆزین**

**نووژەن** / nûjen/: ☞ **نۆژەن**

**نووژی** / nûjî/: ناو. نیسک؛ نژی ☰ عدس

**نووژین** / nûjîn/: چاوگ. کـون کـردن؛ سمـین ☰ سنبیدن؛ سوراخ کردن

**نـووس**[١] / nûs/: نـاو. چـووک؛ سـیرەت؛ ئەنـدامی زایندەی نێرینە ☰ آلت تناسلی نر

**ـ نووس**[٢]: پاشەوشە. ـ نڤیس؛ ـ نـویس: ١. نووسـراو؛ خـەتلـێدراو ‹چـارەنووس› ٢. بنـووس؛ خەتلـێدەر ‹نووشـتەنووس› ☰ ١. ـ نوشـت ٢. ـ نویس

**نووسان** / nûsan/: چـاوگ. ١. نڤیسـان؛ نووسـین ‹نامەکەم نووسا› ٢. لکان؛ چەسپان ‹بە دەستمەوە نووسا› ☰ ١. نوشتن ٢. چسبیدن

**نووسـاندن** / nûsandin/: چـاوگ. ١. نڤیسـاندن ٢. لکاندن ☰ ١. نوشتن ٢. چسبانیدن

**نووسانەوە** / nûsanewe/: چاوگ. نووسـینەوە؛ لـە بەر نووسین ☰ رونویسی کردن

**نووسـاو** / nûsaw/: ئاوەڵـناو. ١. نووسـراو ٢. لکـاو ‹دەنگی نووساو› ☰ ١. نوشته ٢. چسبیده

**نووسـتن** / nûstin/: چـاوگ. تێنەپـەر. //نووسـتی؛ دەنووی؛ بنوو// نڤستن؛ خەوتن ‹زاهیرەن بەیتم لـە نالی و کوردی زۆر کـەمتر نیـە/ تـالعم بەرگەشـتەیە، بەدبەختـە، بـەختم نووسـتووە «حـاجی قـادر»› ☰ خوابیدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: نووسـتوو/ چـاوگی نـەرێنی:

نەنووستن

**نوستنگه** / nûstinge/: نـاو. ۱. جـێ خـەو ۲. ساختمانی تایبـەت بـۆ خـەوتن و حەسـانەوە ☰ ۱و۲. خوابگاه

**نوستو** / nûstû/: ئاوەڵناو. نووسـتی؛ خـەوتوو؛ خەفتگ ‹بنوون و هەر بێدار مەبن/ هەر نووستووانی پێ ئەگەن! «گۆران»› ☰ خوابیده

**نوستەنە** / nûstene/: چاوگ. نووسان؛ نووسین ☰ نوشتن

**نوستی** / nûstî/: ☜ **نوستو**

**نوسران** / nûsran/: چـاوگ. تێنەپـەڕ. نادیـار. //نووسـرای؛ دەنووسـرێی؛ بنووسـرێ// نووسـیان ‹کتێب و دەفتەر و تەئریخ و کاغەز/ بە کـوردی گـەر بنووسرایە زوبانی// مەلاو و شێخ و مـیر و پادشـامان/ هەتا مەحشەر دەما ناو و نیشانی «حاجی قـادر»› ☰ نوشته شدن

■ ئاوەڵناوی بـەرکاری: نووسـراو/ چاوگی نـەرێنی: نەنووسران

**نوسرانەوە** / nûsranewe/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //نووسـرایەوە؛ دەنووسـرێیەوە؛ بنووسـرێوە// نووسیانەوە: ۱. نووسیان؛ وە بەر نووسین کـەوتن ۲. دیسان نووسیان ☰ ۱. نوشته شدن ۲. باز نوشـته شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: نووسراوەوە/ چاوگی نـەرێنی: نەنووسرانەوە

**نوسراو**[1] / nûsraw/: ☜ **نوسراوە**

**نوسراو**[2]: ئاوەڵناو. نووسیاگ ☰ نوشتەشدە

**نوسراوە** / nûsrawe/: نـاو. نووسـراو؛ نووسـیاگ؛ نووسیاو ☰ نوشته

**نوسراوەوە** / nûsrawewe/: ئاوەڵـناو. ۱. نووسـراو؛ نووسیاگ ۲. دیسانەوە نووسراو ☰ ۱. نوشـته شـده ۲. بازنویسی شده

**نوسریاگ** / nûsiryag/: ☜ **نوشته ـ۲**

**نوسـکاندن** / nûskandin/: چـاوگ. تێنەپـەڕ. //نووسکاندت؛ دەنووسکێنی؛ بنووسـکێنە// جـۆرێ دەنـگ دەرهێنـانی سـەگ و ... ☰ نـوعی زوزه کشیدن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: ــــ/ چـاوگی نـەرێنی: نەنووسکاندن

**نوسکن** / nûskin/: ئاوەڵناو. نووکتیـژ؛ بـە سـەری باریک و تیژەوە ☰ نُکتیز

**نوسگە** / nûsge/: ناو. نووسگە؛ دەفتـەر؛ جێگـای شت لێ نووسین ☰ دفتر؛ جای نوشتن

**نوسندە** / nûsinde/: ☜ **نوسەر**

**نوسنە** / nûsne/: ناو. میرزا؛ مونشی ☰ میرزا

**نوسنەک** / nûsnek/: ☜ **نوسەکە**

**نوسـەر** / nûser/: نـاو. نڤیسەڤـان؛ نووسـندە؛ نوویسنەنە؛ نڤیسار؛ نڤیسەر؛ نڤیسکار؛ نوشتۆخ: ۱. ئـەوەی شـتێکی نووسـیوە ‹نووسـەری وتـار› ۲. ئەوەی بەرهەمێک (وەکـوو کتێـب، وتـار، شـانۆنامە و...) دەنووسێ ☰ ۱و۲. نویسنده

**نوسەک**[1] / nûsek/: ناو. ڕۆنیاس ☰ روناس

**نوسـەک**[2]: ئاوەڵـناو. بـە چەسـپ ‹دەمووکانـە زۆر نووسەکە› ☰ چسبناک

**نوسەکە** / nûseke/: نـاو. نوورسـەگ؛ نووسـەنەکە؛ نووسەنگ؛ نووسـەنەک؛ مووسـەکە؛ مووسـەنەک؛ نووسنەک؛ پرمێشک؛ پەنێرشک؛ مەرواڵە ☰ تخم گیاهی خاردار که بر پشم و لباس می‌چسبد

**نوسەنگ** / nûseng/: ☜ **نوسەکە**

**نوسەنەک** / nûsenek/: ناو. ☜ **نوسەکە**

**نوسەنەکە** / nûseneke/: ☜ **نوسەکە**

**نوسیار** / nûsyar/: ناو. خەتخۆش ☰ خوشنویس

**نوسیاگ** / nûsyag/: ☜ **نوسراوە**

**نوسیان** / nûsyan/: ☜ **نوسین**

**نوسیانەوە** / nûsyanewe/: ☜ **نوسرانەوە**

**نوسیاو** / nûsyaw/: ☜ **نوسراوە**

**نوسیای / nûsyay/**: چاوگ. نووسران ▤ نوشته شدن

**نوسیگە / nûsîge/**: ☜ **نوسینگە**

**نوسین[1] / nûsîn/**: چاوگ. تێپەڕ. //نووسیت؛ دەنووسی؛ بنووسە// نووسیان: ١. نڤیسین؛ خەت دان ٢. لکان؛ نووسان ▤ ١. نوشتن ٢. چسبیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەنووسین

**نوسین[2]**: ناو. نووسراوە؛ نڤیسرا؛ ئەوەی نووسراوەتەوە ‹میللەتی بێ کتێب و بێ نووسین/ غەیری کوردان نییە لە ڕوویی زەمین «حاجی قادر»› ▤ نوشته

**نوسینگە / nûsînge/**: ناو. نڤیسنگە؛ نووسیگە: ١. مەکتەب؛ جێگایەک کە دەوێدا کاری بازرگانی و مەزرینگەیی دەکرێ ٢. دەبیرخانە؛ ناوەندی کارگێڕی ▤ ١. دفتر ٢. دبیرخانه

**نوسینەوە / nûsînewe/**: چاوگ. تێپەڕ. //نووسیتەوە؛ دەنووسییەوە؛ بنووسەوە// ١. لە بەر خەت گرتنەوە ‹کتێبەکە دانە و لێی بنووسەوە› ٢. گوتەی کەسێ خستنە سەر کاغەز ‹تۆ بێژە من ئەینووسمەوە› ٣. دیسانەوە نووسین دوای پێداچوونەوە ‹نووسینەوەی دەستوور› ▤ ١. رونویسی کردن ٢. گفتار کسی را نوشتن ٣. بازنویسی کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەنووسینەوە

**. نوسێن / nûsên-/**: پاشەوشە. ـ لکێن ▤ ـ چسبان

**نوشت / nûşt/**: ئاوەڵناو. گلۆف؛ مچۆلە ▤ مُچاله

**نوشتا / nûşta/**: ئاوەڵناو. تۆمارکراو؛ نووسراو ▤ نوشته/ ثبت شده

**نوشتار / nûştar/**: ناو. قەمچان؛ زیچین؛ بازەلان؛ گەمەیەکە بە پەنج خڕکەبەرد ئەکرێ ▤ بازی یەقل دوقل

**نوشتاندنەوە / nûştand(i)newe/**: چاوگ. تێپەڕ. //نووشتاندتەوە؛ دەنووشتێنییەوە؛ بنووشتێنەوە// ١. داهێنان؛ چەماندن ٢. قەد کردن؛ دەق کردن ▤ ١. خم کردن ٢. تا کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـــ/ چاوگی نەرێنی: نەنووشتاندنەوە

**نوشتانەوە / nûştanewe/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //نووشتایەوە؛ دەنووشتێیەوە؛ بنووشتێوە// ١. داهاتنەوە؛ چەمانەوە ٢. قەد بوون؛ دەق بوون ▤ ١. خم شدن ٢. تا شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: نووشتاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەنووشتانەوە

**نوشتاوە / nûştawe/**: ئاوەڵناو. نووشتاوەوە: ١. قەدکراو؛ دەق کریاگ ٢. چەماو؛ چەماوە ‹لە ژێر مێزەرا مەلای نووشتاوە/ ڕیشی بۆ سەر سنگ پرش و بلاوە «گۆران»› ▤ ١. تاشده ٢. خمیده

**نوشتاوەوە / nûştawewe/**: ☜ **نوشتاوە**

**نوشتاوی / nûştawî/**: ناو. ١. قەدکراوی ٢. چەماوی ‹لق نووشتاوی بۆ ناو ئاوە «شێرکۆ»› ▤ ١. تاشدگی ٢. خمیدگی

**نوشترانەوە / nûştranewe/**: چاوگ. چەمانەوە؛ چەمیانەوە؛ نوێریایەوە ▤ خم شدن

**نوشتش / nûştiş/**: چاوگ. نووسین؛ نووسان؛ خەت لە قاغەز دانان ▤ نوشتن

**نوشتۆخ / nûştox/**: ئاوەڵناو. زۆر بەکار (نووسەر) ▤ پُرکار (نویسنده)

**نوشتو / nûştû/**: ☜ **نوشتە ـ١**

**نوشتە / nûşte/**: ناو. ١. نشتوو؛ نڤرشت؛ نڤشت؛ نڤشتۆک؛ نڤشتی؛ نوست؛ نووشتوو؛ نووشتی؛ نیشتوو؛ دۆعای نووسراو ٢. نووسراو؛ نووسریاگ ▤ ١. دعای نوشته شده ٢. نوشته

⊡ **نوشتە نوسین:** دۆعا نووسین ▤ دعا نوشتن

**نوشتەنوس / nûştenûs/**: ناو. دۆعانووس؛ کەسێ کە بۆ خەڵکی چاوەزار دەنووسێ ‹حوققە و قەڵەم لە بەر دەمییە شێخی نووشتەنووس/ ئەفسوونگەری تەمایە لەگەڵ چەرخی حوققەباز «مەحوی»› ▤

دعانویس

**نوشتی** / nûştî/: ☜ **نوشته ـ١**

**نوڤ** / nûv/: ☜ **نوێ**

**نوق** / nûq/: ئاوەڵناو. ١. قووڵ؛ نق ٢. نوقم؛ نقوم؛ ڕۆچوو لە ئاو یان تراوێکدا ☰ ١. گود؛ ژرف ٢. غرق

**نوقان** / nûqan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //نووقای؛ دەنووقێی؛ بنووقێ// ١. نقوم بوون ٢. قووچان؛ چووقان؛ قووجیان؛ بەسرانی ئەندام (وەک: چاو) ‹چاوم نووقاند تا نەیبینم› ☰ ١. غرق شدن ٢. بسته شدن عضو (مانند: چشم)

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: نووقاو/ چاوگی نەرێنی: نەنووقان

**نوقاندن** / nûqandin/: چاوگ. تێپەڕ. //نووقاندت؛ دەنووقێنی؛ بنووقێنە// نووچاندن؛ قووچاندن؛ قووجاندن؛ چووقاندن؛ جووقاندن؛ بەستنی ئەندام (وەک: چاو) ‹چاو بنووقێنن بێ قسە و کەلام/ هەموو نوێژ بکەن بۆ خوای عەلام «قانع»› ☰ برهم نهادن (مانند چشم)

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەنووقاندن

**نوقاو** / nûqaw/: ئاوەڵناو. ١. قوم/ نقومبوو ٢. قووچاو؛ چووقاو ‹هەر دوو چاوم نیوە نووقاو، ئاو تێزاو «شێرکۆ»› ☰ ١. غرقه ٢. بسته؛ برهم آمده

**نوقی** / nûqî/: ناو. کوویری؛ قووڵی ☰ ژرفی

**نوقین** / nûqîn/: چاوگ. قووچان؛ چووقان (چاو) ☰ بسته شدن (چشم)

**نوک**[1] / nûk/: ناو. ١. نیچک؛ سەرنووچک؛ نهیک؛ نیک؛ نووکە؛ تک؛ نک؛ نۆک؛ کەلە؛ جقە؛ سەری تیژ و باریکی هەر شتێ ‹غەریبی تۆم، نەخۆشی تۆ بە گۆشەی چاوی بیمارت/ ئەسیری تۆم شەهیدی تۆ بە نووکی تیری موژگانت «وەفایی»› ٢. ☜ **نۆك** ٣. ئاسنۆکەی خواری ناوەڕاستی سەرەتەشی ٤. ☜ **نکل** ☰ ١. نُک ٢. ☜ **نۆك** ٣. میخ نیم حلقەی سر دوک ۴. ☜ **نکل**

⊡ **نوک تەڕ کردن**: فرمێسکی درۆینە ڕژاندن ☰ اشک تمساح ریختن

**نوک**[2]: ئاوەڵناو. چاک؛ باش ‹نووک و بەدی بۆ باس کردن› ☰ نیک

**نوکان** / nûka/: چاوگ. دەنگی بڕەبڕە لە گەروو هاتنی سەرەتای گریان ☰ صدای بریده از گلو برآمدن در شروع گریه

**نوکاندن** / nûkandin/: چاوگ. تێنەپەڕ. //نووکاندت؛ دەنووکێنی؛ بنووکێنە// نووکان؛ دەنگی بڕەبڕە لە گەروو دەرهێنان لە سەرەتای گریاندا ☰ صدای بریده از گلو برآوردن در شروع گریه

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەنووکاندن

**نوکانن** / nûkanin/: جووزەجووز کردن؛ جووزاندن ☰ وز ـ وز کردن

**نوکپەڕیو** / nûkpeřîw/: ئاوەڵناو. کۆل ☰ نُک‌شکسته (سوزن)

**نوکتیژ** / nûktîj/: ئاوەڵناو. بە سەری باریک و تیژەوە ☰ نوک‌تیز

**نوکن** / nûkin/: ئاوەڵناو. نووزەڵ؛ زۆر نووکەنووک‌کەر ☰ بسیار نالان

**نوکنای** / nûknay/: چاوگ. گڕوو گرتن (زۆرتر زارۆ) ☰ بهانه گرفتن (کودک)

**نوکوسو** / nûkûso/: ناز. سەرەوقولە؛ یارییەکی کچانەیە بە دەرزیلەوە دەکرێ ☰ از بازی‌های دخترانه

**نوکە** / nûke/: ناو. ١. نکەنک؛ نووک ٢. ☜ **نوها** ☰ ١. نک و ناله ٢. ☜ **نوها**

⊡ **نوکە برین**: بێدەنگ کردن ☰ بی‌صدا کردن

**نوکە کردن**: نووکاندن ‹وس بە! نووکە نەکەی!› ☰ نِک‌وناله کردن

**نوکە لێ نەهاتن**: نقە نەکردن؛ وسکوت بوون ‹هەرچێکیان گوت و هەرچێکیان پێ کرد نووکەی لێ نەهات!› ☰ لب از لب نجُنباندن

**نوکەتەشی / nûketeşî/**: ناو. نیکمسمار ☰ میخ نیم‌حلقه‌ی سر دوک نخ ریسی
**نوکەر / nûker/**: ☜ نۆکەر
**نوکەسۆ / nûkeso/**: ناو. سەرەوقوڵە؛ کایەیەکی کچانەیە بە دەرزیلە دەیکەن ☰ از بازی‌های دخترانه
**نوکەسورکە / nûkesûrke/**: ☜ نۆکەسوورە
**نوکەنوک / nûkenûk/**: دەنگەناو. نووکە؛ گریانی بە ناڵەوە ‹وەک چاوی وشکەسۆفییەکانی لە دار و بەرد/ دەردێن بە سەد تەرەننوم و گریان و نووکەنووک «نالی»› ☰ گریه و زاری
**نوکەنوککەر / nûkenûkker/**: ئاوەڵناو. جووکی؛ جووکن ☰ نق‌نقو
**نوکەنیا / nûken(i)ya/**: ناو. سەرنیا؛ دەمەزەرد ☰ ترمیم نوک گاوآهن
**نوکیای / nûkyay/**: چاوگ. هاتنە نووکەی زارۆ ☰ به گریه افتادن کودک
**نوم / nûm/**: ☜ نیوـ١
**نون[1] / nûn/**: ناو. ١. ☜ نان ٢. کەمایەسی و عەیب ‹نوون لە چاوی مندا بێ لەودا نییە› ٣. نێ؛ ناوی پیتی بیست‌حەوتەمی ئەلفوبێی کوردی ٤. هوورترین شت ☰ ١. ☜ نان ٢. کاستی؛ نقص ٣. نام حرف بیست‌وهفتم الفبای زبان کردی ۴. ذرّە
**نون[2]**: ☜ نوخون
**نون‌پەتی / nûnpetî/**: ☜ نانی نیشکی
**نونجگ / nûncig/**: ناو. نوچک؛ نونجک؛ مست؛ مشت؛ پەنجەی قووچاو ☰ مشت
**نوننایەوە / nûnnayewe/**: چاوگ. نووشتاندنەوە ☰ خم کردن
**نونەر / nûner/**: ☜ نوێنەر
**نونەنون / nûnenûn/**: ئاوەڵکار. پرساوپرس؛ پرسێن- پرسێن ☰ پُرسان ـ پُرسان
**نونیایەوە / nûnyayewe/**: چاوگ. نووشتانەوە ☰ خم شدن
**نوهاڵ / nûhał/**: ناو. تازەلاو؛ تازەجەوان ☰ نوجوان
**نوهیڤ / nûhîv/**: ناو. مانگی لە نوێ؛ مانگی یەکشەوە ☰ هلال نو
**نوی / nûy/**: ☜ نوێ
**ـ نویس / nûys-/**: پاشەوشە. ـ نووس؛ ـ نڤیس ☰ ـ نویس
**نویسان / nûysan/**: چاوگ. نووسین ☰ نوشتن
**نویسگە / nûysge/**: ☜ نووسگە
**نویسننە / nûysinne/**: ☜ نووسەر
**نویسین / nûysîn/**: چاوگ. نوویسان؛ نووسین ☰ نوشتن
**نوینک / nûynik/**: ناو. ١. ☜ نوێنک ٢. ☜ نوێن[1]ـ٢
**نوینە / nûyne/**: ☜ نوێنەر
**نِه / nih/**: ناو. بلوێر؛ بلوول؛ بلوور؛ نای ☰ نی‌لبک
**نە[1] / ne/**: ناو. نا؛ نۆ؛ نە؛ نەی؛ نێ؛ نیشانەی وەرامی پێچەوانە ☰ نه
**نە[2]**: ئاوەڵکار. نا: ١. نیشانەی دژایەتی دەگەڵ قسە و پێشنیاری کەسێک ‹ـ بخۆ! ـ نە، ناخۆم› ٢. نیشانەی وەڵامی پێچەوانەی پرسیاری کەسێک ‹ـ سارا هات؟ ـ نە، نەهات› ٣. نیشانەی پێداگری ‹نە، ئیدی کاری وا ناکەم› ☰ ١تا٣. نه
**نە[3]**: ئامراز. ١. نیشانەی پێچەوانە کردنەوەی دۆخ یان چۆنییەتییەک ‹نە کەس پیاوت بێ، نە پیاوی کەس بە!/ نە چاوەڕوانی گیرفان و دەس بە! «موفتی پێنجوێنی»› ٢. لە؛ دە ‹هەلای سەرمەستەن وە شنۆی ئێلاخ/ بۆی نەوپایزش نامان نە دەماخ «مەولەوی»› ٣. بۆ پرسیار ‹تۆیش هەبووی، نە؟› ٤. نەک؛ نەکوو؛ نەوەکوو؛ نەوەک؛ نەکوا؛ نەوا ‹نە پێت وا بێ دژ بەم کارەم› ☰ ١. نە ٢. در ٣. حرف پرسش ۴. نه اینکه
**نە ـ[4]**: پێشگر. ١. لە ناو، ئاوەڵناوی نەرێنی دروست

دەکات ‹نـەیار؛ نەچەسـپ› ٢. لـە ئاوەڵـناو، ئاوەڵناوی نەرێنی دروست دەکا ‹نەبەدل› ٣. لە ڕەگ، ئاوەڵناوی نەرێنی دروست دەکات ‹نـەزان؛ نەبەز› ⚑ صفت منفی ساز: ١. از اسم ٢. از صفت ٣. از بُن فعل

**نه°**: دەنگ. نا؛ نەیژی؛ نەکەی؛ نەڵەی؛ نـە توخـوا؛ نەواچی؛ نیشانەی سەر سوورمان و بـڕوا نـەکردن ‹پارەکەم گوم کرد ـ نە! مەگەر ئەبێ› ⚑ نه

**نەء** / ne'/: ئاوەڵکار. نەئئا؛ نەئا؛ نە؛ نا؛ ناو؛ نـۆ؛ نـوو؛ وەرامی نەرێنی بە پێداگرییەوە پێچەوانـەی «ئـا» ⚑ نه

**نەئئا** / ne"a/: ☚ نەء

**نەئا** / ne'a/: ☚ نەء

**نەئاژۆتی** / ne'ajotî/: ئاوەڵناو. نەکێڵـدراو ⚑ شخم‌نزده

**نەئاشکرا** / ne'aşk(i)ra/: ☚ نەدیار

**نەئال** / ne'al/: ئاوەڵناو. ١. شـەڕانی؛ شـەڕفرۆش؛ تووڕە و تۆسن ٢. بە ئاژاوە؛ قنگ‌بەگێچەڵ ⚑ ١. ستیزه‌جو ٢. فتنه‌انگیز

**نەبا** / neba/: نزا. نەکا؛ ناکا؛ نەوەکا؛ نەبادا ⚑ مبادا

**نەبات** / nebat/: ناو. نـەوات؛ مـاکێکی بلـۆرینی شیرین و ڕەقە لـە کولانـدن و سـارد کردنـەوەی شیلەی قەن بەرهەم دێ و دەخورێ ⚑ نبات

**نەباتی** / nebatî/: ئاوەڵناو. بە ڕەنگی نـەبات ⚑ بـه رنگ نبات

**نەبادا** / nebada/: ☚ نەبا

**نەبار** / nebar/: ئاوەڵناو. ١. ☚ نالەبار ٢. نەزۆک (باران)؛ بە بێ توانای بارین ‹لە چاوا نم نەما بۆ گریە نوورەی سەجدە بەر دەریـە/ سیاسالـم نـەبارە نـوێژی ئیستیسقا نەکـەم چ بکـەم؟ «مـەحوی»› ⚑ ١. ☚ **نالەبار** ٢. نازا (ابر)

**نەباش** / nebaş/: ئاوەڵناو. خـراپ؛ خـراو ‹ئـەو مرۆیەکە نەباش› ⚑ بد

**نەبالغ** / nebaliğ/: ☚ **نابالغ**

**نەبان** / neban/: ئاوەڵناو. نـەوان؛ نـەواون: ١. تایبەتمەندی شیردەرێ کە بێچووی خۆی نـاوێ و شیری ناداتێ ٢. *[مەجاز]* دەنگ لە یەکێ گۆڕیـو ‹کوڕەکەم زۆرم لێ نەبان و نـامۆ بـوو؛ هـەر دەگریـا: «دەچمەوە ماڵی خۆمـان»، نیـازی ماڵـە مـامی بـوو! «هەژار، *چێشتی مجێور*»› ٣. بەدمەجاز؛ هەمیشـە قەڵس و تووڕە ⚑ ١. ویژگی دامی که به بچه‌ی خود شیر نمی‌دهد ٢. کم‌اعتنا؛ بی‌میل ٣. بدخُلق؛ عصبانی

**نەبانۆک** / nebanok/: ئاوەڵناو. ١. بێـزار؛ وەڕەز؛ جاڕز ٢. خۆ بوێر لە کار؛ خۆ وەشێر لە ئـەرک ⚑ ١. بیزار ٢. از زیر کار دررو

**نەباو** / nebaw/: ئاوەڵناو. ١. ☚ **نابـاو** ٢. *[مـەجاز]* بیژی و بەدفەڕ ⚑ ١. ☚ **نابـاو** ٢. حرامزاده

**نەبرچی** / nebirçî/: ئاوەڵناو. زک‌تێر ⚑ سیر

**نەبرژاو** / nebirjaw/: ☚ **نەورشتە**

**نەبرژیاگ** / nebirj(i)yag/: ☚ **نەورشتە**

**نەبڕ** / nebiř/: ئاوەڵناو. ١. کول؛ نەتیژ ‹ئـەم تـەورە نەبڕە› ٢. کار لە دەست نەهاتووی بێ‌بڕشت ⚑ ١. کُند ٢. سُست‌عنصر

**نەبڕی** / neb(i)řî/: ئاوەڵـناو. بـەردەوام؛ بـێ لەناوچوون ⚑ پاینده

**نەبڕێ** / neb(i)řê/: ئاوەڵناو. نابەجێ؛ ناڕەوا ⚑ ناروا

**نەبز** / nebz/: ناو. شوار؛ شوارۆ؛ پت؛ چـڵ؛ کـاری لێدانی ڕەگی سووری لەش، کـە بـە هـۆی کـرژ بوونەوەی ماسوولکەی دڵ بەدی دێت ⚑ نبض

**نەبزو** / neb(i)zu/: ئاوەڵناو. نـەجووڵ؛ سـنگەپێ؛ چەق ⚑ ثابت؛ غیرمُتحرک

**نەبگ** / nebig/: ناو. میـوەی داری کنـار کـە لـە گۆیژەزەردە دەکا و درشت‌تـرە ⚑ میـوەی درخـت سدر

**نەبناڤ** / neb(i)nav/: ئاوەڵناو. بۆرەپیاگ؛ بێ‌دەنگ و ناو ⚑ گمنام

**نەبو**[١] / nebû/: ناو. دۆخ یان چۆنیەتی نەبوون ‹خوا ئێمەی لە نەبوو دروست کرد› 🇮🇷 عدم

**نەبو**[٢]: ئاوەڵناو. نەگەیشتوو ‹تریکەم هێشتا نەبووە› 🇮🇷 نارسیده؛ کال

**نەبونی** / nebûnî/: ناو. ١. دۆخ یان چۆنیەتی نەبوون ٢. *[ئەدەبی]* فەقیری؛ دەستەنگی ‹نە دی شەو و شەونخوونی/ نە چێشتی دەردی نەبوونی «هێمن»› 🇮🇷 ١. نیستی ٢. نداری؛ فقر

**نەبە** / nebe/: ناو. حاشا؛ هاشا؛ ئینکاریی؛ دۆخی نەدرکاندنی ڕاستی 🇮🇷 انکار

**نەبەدی** / nebedî/: ئاوەڵناو. ١. لێڵ؛ ناڕوون ٢. نادیار؛ بەرپێوار؛ نەدیو؛ غەیب ‹دنیای نەبەدی› ٣. غەیبی؛ لە نادیارەوە هاتوو ‹لە مەیدانی شەڕا تیری نەبەدی نەیپێکێ› 🇮🇷 ١. مُبهم ٢. غیب ٣. غیبی

**نەبەرد** / neberd/: ئاوەڵناو. نەوەرد؛ ئازا؛ ڕەشید؛ بەکار ‹گەلی نەبەرد› 🇮🇷 دلیر

**نەبەز** / nebez/: ئاوەڵناو. ١. نەوەز؛ کۆڵنەدەر ‹لاوانی نەبەز› ٢. شل و سست لە ڕاکردنا 🇮🇷 ١. شکستناپذیر ٢. کُند در دویدن

**نەبەکام** / nebekam/: ئاوەڵناو. نەوەکام: ١. ناکام؛ کاو نارەوا ٢. نیوەگەیشتووی هێشتا نیوە کاڵ 🇮🇷 ١. ناکام ٢. نارس

**نەبەکۆ** / nebeko/: نزا. نەکا؛ نەوە 🇮🇷 مبادا

**نەبەگە** / nebege/: ئاوەڵناو. شلوول؛ خۆنەگرتوو 🇮🇷 سُست و نااستوار

**نەبهیست** / nebihîst/: ناو/ ئاوەڵناو. کەڕ؛ نەبیس؛ گوێ کپ 🇮🇷 کر؛ ناشنوا

**نەبی** / nebî/: ناو. پێغەمبەر 🇮🇷 نبی

**نەبیران** / nebîran/: چاوگ. مەهگران؛ مەوریان؛ بێزوو/ بێزگ کردن 🇮🇷 ویار کردن

**نەبیرە** / nebîre/: ناو. نەڤیچی؛ نەوەزازا؛ نەویرە 🇮🇷 نبیره

**نەبیس** / nebîs/: ☜ نەبیست

**نەبیست** / nebîst/: ئاوەڵناو. نەبیس: ١. گوێنەگر؛ لاسار ٢. کەڕ؛ گوێ نەبیس 🇮🇷 ١. لجباز ٢. کر؛ ناشنوا

**نەبین** / nebîn/: ئاوەڵناو. ١. چاوپرووش ٢. پیوار؛ نادیار؛ نەدیو 🇮🇷 ١. کم‌بین ٢. ناپیدا

**نەبینا** / nebîna/: ناو/ ئاوەڵناو. کۆر؛ کوێر؛ بێ‌چاو 🇮🇷 نابینا

**نەبینراو** / nebînraw/: ☜ نەدیو

**نەبینە**[١] / nebîne/: ناو. شیشەی لێڵ 🇮🇷 شیشەی مات

**.نەبینە**[٢]: پاشوشە. نەدیتوو؛ نەبینراو؛ بێ‌دیتن ‹وەرە با کەس‌نەبینە بکەین!› 🇮🇷 ـ نادیده

**نەپا** / nepa/: ئاوەڵناو. لە فەوتان نزیک 🇮🇷 ناپایدار

**نەپاتی** / nepatî/: ئاوەڵناو. نەکوڵاو؛ هەر کاڵ 🇮🇷 ناپُخته

**نەپاخ** / nepax/: ناو. مووشەدەمەی ئاسنگەر 🇮🇷 دم آهنگری

**نەپاخچی** / nepaxçî/: ناو. کەسێ کە بە نەپاخ کار دەکا 🇮🇷 کسی کە با دم آهنگری کار می‌کند

**نەپارێز** / neparêz/: ناو. دەستکوێر؛ دەستگەوج؛ دەسگەوج 🇮🇷 دست و پا چُلُفتی

**نەپاک** / nepak/: ئاوەڵناو. ١. چەپەڵ؛ گەمار؛ پیس ٢. *[کینایە]* فێڵباز و دووڕوو 🇮🇷 ١. کثیف ٢. مکّار

**نەپایی** / nepayî/: ئاوەڵناو. بێ‌ئاگادار؛ بێ‌چاودێری‌کەر 🇮🇷 بدون محافظ

**نەپخاندن** / nepxandin/: چاوگ. ١. فوو دان؛ پف تێ‌کردن ٢. *[مەجاز]* تاریف کردن بە درۆ 🇮🇷 ١. دمیدن ٢. مدح دروغین گفتن

**نەپس** / nepis/: ئاوەڵناو. نەوڕ؛ تایبەتمەندی هەوداێ کە ناپسێ 🇮🇷 ویژگی نخ مُحکم

**نەپشت نەزک** / ne pişt ne zik/: ئاوەڵناو. *[پلار]* بێ بەروپشت؛ ناڕاست و دووڕوو 🇮🇷 دورو

**نەپندی** / nepindî/: ئاوەڵناو. نەپەندی؛ نەپەنی؛

شاراوە؛ نادیار ‹لە شوێنێک نەپەندی/ نەپەندی وەک جێگە ژوانی بەفری خودا و بلێسەی عەشقێکی نەبەدی «شێرکۆ»› ◘ ناپیدا

**نەپوخت** / nepuxt/: ئاوەڵناو. ناپوخت: ١. پیس و پۆخڵ ٢. کاربلاو؛ شپرز ‹کاری نەپوخت› ◘ ١. کثیف ٢. نامنظم

**نەپوختە** / nepuxte/: ئاوەڵناو. نەکولاو؛ کاڵ ◘ ناپخته؛ خام

**نەپۆڕ** / nepoř/: ☜ **ناپۆڕ**

**نەپەخەک** / nepexek/: ئاوەڵناو. فووودراو؛ پفدریاگ؛ پەنەماو بە با ◘ بادکرده

**نەپەڕووشک** / neperûşk/: ناو. ١. چرنووکی مەلی ڕاوکەر ٢. نەچیری مەلی ڕاوکەر ◘ ١. چنگال پرندەی شکاری ٢. نخجیر پرندەی شکاری

**نەپەندن** / nependin/: چاوگ. شاردنەوە؛ گوم کردن لە بەر چاوان ◘ پنهان کردن

**نەپەندی** / nependî/: ☜ **نەپندی**

**نەپەنی** / nepenî/: ☜ **نەپندی**

**نەپیاو** / nep(i)yaw/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **ناپیاو** ٢. لێنەهاتوو؛ تایبەتمەندی پیاوێ کە توانای سەرجێیی کردنی نەبێ ◘ ١. ☜ **ناپیاو** ٢. ناتوان جنسی (مرد)

**نەپێژاندی** / nepêjandî/: ئاوەڵناو. نەکولاو؛ نەبرژاو ◘ کال؛ ناپُخته

**نەپێکهاتی** / nepêkhatî/: ئاوەڵناو. پێکنەهاتوو؛ ئامادەنەکراو؛ جێبەجێنەکراو ◘ مُهیّا نشده

**نەتاشراو** / netaşraw/: ناو. نەتاشیاگ؛ نەتاشیاو: ١. تیخلێنەدراو ٢. *[مجاز]* کەمفام و پەروەردە نەکراو ◘ ١. نتراشیده ٢. زُمُخت و کم‌فهم

**نەتاشیاگ** / netaşyag/: ☜ **نەتاشراو**

**نەتاشیاو** / netaşyaw/: ☜ **نەتاشراو**

**نەتر** / netr/: ناو. ١. ڕەت؛ تەکان؛ بزاو ٢. ماتی و بێدەنگی ◘ ١. هُل؛ تکان ٢. خاموشی

**نەتراندن** / netrandin/: چاوگ. ١. بزاوتن؛ ڕەت پێ دان ٢. بێدەنگ و جووڵە کردن ٣. دڵ دانەوە ◘ ١. تکان دادن؛ هُل دادن ٢. ساکت و ساکن کردن ٣. آرام کردن

**نەترس** / netirs/: ئاوەڵناو. بوێر؛ ئازا؛ گەڕناس ◘ نترس

**نەترسی** / netirsî/: ناو. ئازایەتی؛ بوێری؛ چاوسووری ◘ شُجاعت

**نەترک** / netrik/: ناو. پرپرە و پەرەنگی زەنبەر بە چەشنی مانگیلە ‹پەیوەستە ژ وەسلێ تە دمێنم کو سەراسەر/ بشکۆژ و تەلیسم و وەرەق و نەترک و بازن «مەلای جزیری»› ◘ از زیورآلات

**نەترنایش** / netrnayîş/: چاوگ. لە ژێر چاوەدێری گرتن ◘ تحت نظر گرفتن

**نەترە** / netre/: ناو. ١. ورە؛ غیرەتی دڵ؛ قەوەتی دەروون ‹نەترەی نەما دوژمن لە بەر پێشمەرگە/ لە گشت لاوە هەلات و نەیگرت بەرگە «هێمن»› ٢. لەتر؛ ڕەت ◘ ١. جُرأت ٢. تکان

▣ **نەترە بردن**: ناو. ١. زراو بردن؛ ترساندن ٢. ڕەت بردن ‹مەستی کردبوو و نەترەی دەبرد› ❋ هەروەها: **نەترە چوون** ◘ ١. زهرەترک کردن ٢. تلوتلو خوردن

**نەترە دان**: ناو. ڕەت بردن ◘ تکان خوردن

**نەترەبۆق** / netreboq/: ئاوەڵناو. زەبەلاحی تەژە ◘ لندهور

**نەترین** / netrîn/: چاوگ. دڵ درانەوە ◘ دلداری داده شدن

**نەتشت** / netişt/: ئاوەڵناو. نەهیچ ◘ ناچیز

**نەتک** / netk/: ناو. ١. ڕێگەی سەنگفەرش ٢. ڕێگەی پیادە لە خیاباندا ٣. شانە؛ قەراخ جادە ◘ ١. راه سنگفرش ٢. پیادەرو ٣. شانەی جاده

**نەتل** / netil/: ناو. نەتەل؛ نەتەوی؛ دوژمن؛ نەیار؛ دژ ◘ دُشمن

**نەتڵ** / netił/: ئاوەڵناو. ١. خۆفناک؛ بەسام؛ زاتبەر ٢. لە ڕێگە دەرچوو 🇮🇷 ١. سهمناک ٢. مُنحرف

**نەتم** / netim/: ئاوەڵناو. نتم؛ کەمقسە 🇮🇷 کمحرف

**نەتم** / netm/: ئاوەڵناو. کاتی؛ ئامانەتی؛ نە بەیەکجاری 🇮🇷 موقتی

**نەتوتشت** / netutişt/: ئاوەڵناو. بێکەڵک؛ هیچوپووچ 🇮🇷 بی‌بهره

**نەتوکەس** / netukes/: ئاوەڵناو. نامەرد؛ ناکەس؛ خوێڕی 🇮🇷 نامرد

**نەتوهاوە** / netuhawe/: ناو. کاری نالەبار؛ کردەی ناحەز 🇮🇷 کار زشت

**نەتۆرە** / netore/: ☜ ناتۆرە

**نەتو** / netû/: ئاوەڵناو. بەدفەڕ؛ ئاکار خراپ 🇮🇷 بداخلاق

**نەتورە** / netûře/: ئاوەڵناو. لەسەرخۆ؛ هێدی؛ هێمن 🇮🇷 آرام

**نەتە** / nete/: ئاوەڵناو. ١. شێوەرد دراوی ئامادەی چاندن (زەوی) ٢. تازەشین بوو (خەڵە) 🇮🇷 ١. شخم‌زده‌ی آماده‌ی کشت (زمین) ٢. تازه روییده (غلّه)

**نەتەرە** / netere/: ناو. تەشی؛ لەتەر 🇮🇷 دوک نخ‌ریسی

**نەتەکن** / netekin/: ئاوەڵناو. بڤە؛ جێی مەترسی؛ هیلاک 🇮🇷 خطرناک

**نەتەل** / netel/: ☜ نەتل

**نەتەڵە** / neteře/: ئاوەڵناو. ترسێنەر؛ مرۆترسێن 🇮🇷 ترساننده

**نەتەنها** / netenha/: ☜ نەتەنیا

**نەتەنیا** / neten(i)ya/: ئامراز. نەکهەر؛ نەهەر؛ نەتەنها؛ نەوەک ‹نەتەنیا کار نازانێ، درۆزنیشە!› 🇮🇷 نەتنها

**نەتەوایەتی** / netewayetî/: ناو. نیشتمانەتی؛ قەومایەتی 🇮🇷 ملّی

**نەتەوە** / netewe/: ناو. ١. گەل؛ میللەت ‹نەتەوەی کورد› ٢. تۆرەمە؛ ڕەگەز ‹نەتەوەی ئاریایی› ٣. پشت؛ زاروزیچ ‹نەتەوەی ئادەم› 🇮🇷 ١. ملت ٢. نژاد؛ نسل ٣. نواده

**نەتەوەپەرستی** / neteweperistî/: ناو. گەلپەرستی؛ نەتەوەخوازی؛ گەلحەزی؛ دڵبەستەیی و بڕوا بە گەلی خۆ، بەتایبەت بڕوا بە سەرتر بوونی گەلی خۆ و پێداگری لە سەر فەرهەنگ و قازانجی گەل لە بەرامبەر گەلانی‌ترەوە 🇮🇷 ملی‌گرایی

**نەتەوەخوازی** / netewex(i)wazî/: ☜ نەتەوەپەرستی

**نەتەوەیی** / neteweyî/: ئاوەڵناو. نیشتمانی؛ سەر بە نەتەوە ‹کۆنگرەی نەتەوەیی› 🇮🇷 ملّی

**نەتەوی** / netewî/: ☜ نەتل

**نەتیجە** / netîce/: ناو. نەتیژە: ١. ئاکام؛ حاسڵی شتێ ٢. منالی نەوە 🇮🇷 ١و٢. نتیجه

**نەتیژە** / netîje/: ☜ نەتیجە

**نەتێدا** / netêda/: ئاوەڵناو. نەتێو؛ بەدەر؛ ڕفووزە؛ ڕەگەڵ نە 🇮🇷 مردود

**نەتێر** / netêr/: ئاوەڵناو. *(مەجاز)* هەژار؛ برچی؛ دەسکورت 🇮🇷 بینوا

**نەتێو** / netêw/: ☜ نەتێدا

**نەجات** / necat/: ناو. ڕزگاری ‹کوردی بەغدا و سولەیمانی بۆ نەجاتیان تێدەکۆشین و لەوێ کۆ دەبوونەوە «هەژار، چێشتی مجێور»› 🇮🇷 نجات

⊡ **نەجات بوون**: ١. ڕزگار بوون ‹ـ کاکە دەڵێی چی هەڵێم؟ ـ نا، تازە نەجاتت بووە. هەڵێی خراپە. حاجی محەممەد بە پیاوێکی پیاو دەناسم، فریودان و درۆی نییە «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. تەواو بوون؛ بە ئەنجام گەیشتنی کار ‹کاری دروێنە نەجات بوو› ٣. لە کۆڵ بوونەوە ‹نەجاتم بوو لە دروێنە› ٤. دەرباز بوون؛ خەڵستن ‹لەگەڵ دڵ شەرتە سالم! گەر نەجاتم بوو لە تارانا/ بەهەشت

ئەر بێتــە دەشــتی ڕەی، بــە ئیرانــا گــوزەر ناکــەم! «سالم»› 🇮🇷 ١. آزاد شدن ٢. پایـان یـافتن کـار ٣. خلاص شدن

**نەجات دان**: ١. ڕزگار کردن ‹سەفیر گـوتی: مـن جارێک کوردێک لە ئیعـدامی نـەجات داوم، ژیـانم لەو کوردەوە دەزانم «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. تەواو کردنی کـار ‹نـەجاتی دە، بـا بـڕوا!› 🇮🇷 ١. نجات دادن ٢. به انجام رساندن

**نەجاخ** / necax/: نـاو. نـەژاخ؛ تەورۆکـە؛ تـەوری پچووک 🇮🇷 تبر کوچک

**نەجار** / necar/: ☜ نەجاڕ

**نەجاڕ** / necař/: ناو. نەجار؛ نەژاڕ؛ دارتاش 🇮🇷 نجّار

**نەجاڕی** / necařî/: نـاو. مەرەنگۆزەی؛ دارتاشی: ١. کار و پیشەی نەجاڕ ٢. دووکـانی دار تاشـین 🇮🇷 ١و٢. نجّاری

**نەجدی** / necdî/: ئاوەڵناو. نژدی؛ کلک قەیچی کراو (ئەسپ) 🇮🇷 دم قیچی شده (اسب)

**نەجس** / necis/: ئاوەڵناو. گلاو؛ زۆر پیس 🇮🇷 نجس

**نەجڤ** / necv/: ☜ نەجم

**نەجم** / necim/: ئاوەڵـناو. نـەجڤ؛ بـێجووڵـە 🇮🇷 بی‌حرکت

**نەجمە** / necme/: نـاو. ئەسـتێرەی سـەر شـانی ئەفسەر 🇮🇷 ستارەی سردوشی

**نەجەلانـــــدی** / necelandî/: ئاوەڵـــــــناو. ١. مشت‌ومال‌نەدراو ٢. خۆڕست؛ خۆکرد 🇮🇷 ١. صیقل نشده ٢. طبیعی

**نـەجیب** / necîb/: ئاوەڵـناو. نـەجیم؛ نـەجیو: ١. ڕەســەن ٢. ئاکاربــاش 🇮🇷 ١. نجیــب؛ اصـیل ٢. خوشرفتار

**نـەجیبزادە** / necîbzade/: ئاوەڵناو. نـەجیبزایـە؛ نـەجیمزایـە؛ نـەجیمزادە؛ خانـەدان؛ ڕەهیشـتە؛ هـیلاد؛ پسـمیران؛ بنیچەئەسـڵ؛ جـێگـەورە 🇮🇷 نجیبزادە

**نەجیبزایە** / necîbzaye/: ☜ نەجیبزادە

**نەجیم** / necîm/: ☜ نەجیب

**نەجیمزادە** / necîmzade/: ☜ نەجیبزادە

**نەجیمزایە** / necîmzaye/: ☜ نەجیبزادە

**نەجیو** / necîw/: ☜ نەجیب

**نەچار** / neçar/: ☜ ناچار

**نەچیر** / neçîr/: ☜ نێچیر

**نەچیرڤان** / neçîrvan/: ☜ نێچیرڤان

**نەچیرگ** / neçîrig/: ☜ نێچیر

**نەچیروان** / neçîrwan/: ☜ نێچیرڤان

**نەچێ** / neçê/: ئاوەڵناو. خراپ و نالەبار 🇮🇷 زشـت و ناپسند

**نەحس** / neĥs/: ئاوەڵـناو. نەخس؛ شـووم؛ بـێفـەڕ؛ بەدودم؛ جووتقۆشە؛ قۆشمـە؛ قەشـان؛ قۆشـقە. هەروەها: **نەحسی** 🇮🇷 شوم

**نەحلەت** / neĥlet/: ☜ نەعلەت

**نەحلەتی** / neĥletî/: ئاوەڵناو. نەلامەت؛ بـێفـەڕ 🇮🇷 لعنتی

**نەخ** / nex/: ناو. داوە بەنی لە پەموو یان خوری 🇮🇷 نخ

**نەخازا** / nexaza/: ☜ نەخوازە

**نەخازە** / nexaze/: ☜ نەخوازە

**نەخاسم** / nexasim/: ☜ نەخوازە

**نەخافڵ** / nexafił/: ☜ ناخلاف

**نەخالی** / nexalî/: ☜ نهالی

**نەخاندی** / nexandî/: ☜ نەخوێندەوار

**نەخت**[١] / next/: ناو. ١. قەلەن؛ شیربایی ٢. پـارەی لە سکەدراو 🇮🇷 ١. شیربها ٢. پول سکەای

**نـەخت**[٢]: ئاوەڵـناو. ١. نــەختی؛ نەغــد؛ وشـــک؛ پێچەوانــەی قــەرز ‹پـارەی نـەخت› ٢. ئـادان؛ بەبرشت؛ بە بەروبووم ‹زەوی نـەخت› ٣. پڕبایـەخ ‹کـوڕێ نەختــی بـوو› 🇮🇷 ١. نقـد ٢. حاصـلخیز ٣. گرانمایه

**نەخت**[٢]: ئاوەلکار. نەختی؛ بە نەخت ‹نەخت بە چەند؟› ☰ نقدی

**نەختاڵ / nextał/**: ☜ **نەختۆکە**

**نەختوپوخت**[١] **/ next û puxt/**: ئاوەلناو. نەغدوپوخت؛ بێ‌عەیب و کەمایەسی ‹کاریکی نەخت‌وپوخته› ☰ بی کم و کسر

**نەختوپوخت**[٢]: ئاوەلکار. نەغدوپوخت: ١. بێ‌عەیب و کەمایەسی ‹نەخت‌وپوخت کاریان کردووە› ٢. گش؛ سەرلەبەر ‹قسەکەی نەخت‌وپوخت لە بەردەم دانا› ☰ ١. بی نقص ٢. همگی؛ عموماً

**نەختۆکە / nextoke/**: ئاوەلکار. نەختاڵ؛ نەختووکە؛ کەمووکە؛ زۆر کەم ‹ئەو نەختۆکە گەنمەم هەیە و بەس!› ☰ کَمَک؛ بسیار اندک

**نەختوکە / nextûke/**: ☜ **نەختۆکە**

**نەختە / nexte/**: ناو. سەرمای سەخت ☰ سرمای سخت

**نەختە . نەختە / nexte nexte/**: ئاوەلکار. ڕەیزە ـ ڕەیزە؛ کەم ـکەم ☰ اندک ـ اندک

**نەختی / nextî/**: ☜ **نەخت**[٣]

**نەختینە / nextîne/**: ناو. نەغدینە: ١. گەنجینە ٢. دراو؛ پارەی باوی ولات کە دانوستانی پێ دەکرێت ☰ ١. گنجینه ٢. پول رایج

**نەختێ / nextê/**: ئاوەلکار. نەختێک؛ کەمێ؛ کەمووکەیێ ‹نەختێ لەو مێوژەم بدەرێ› ☰ اندکی

**نەختێک / nextêk/**: ☜ **نەختێ**

**نەخری**[١] **/ nexrî/**: ناو. ١. ☜ **نوخوری** ٢. بالاتە؛ نۆبەرەی میوە ☰ ١. ☜ **نوخوری** ٢. نوبر میوه

**نەخری**[٢]: ئاوەلناو. خورێن؛ خرێن؛ خورێنی؛ دڵخالی؛ ناشتا؛ هێشتا هیچ‌نەخواردوو پاش لە خەو هەستان ☰ ناشتا

**نەخرین / nexrîn/**: چاوگ. خورێن/ دڵخالی بوون ☰ ناشتا بودن

**نەخس / nexs/**: ☜ **نەحس**

**نەخش / nexş/**: ناو. نەقش: ١. ڕەنگ و شکڵی دروستکراو بە دەست ٢. بەخت و هات ‹نەخشی هێناوە› ☰ ١. نقش و نگار ٢. شانس

**نەخشار / nexşar/**: ☜ **نەخشدار**

**نەخشان / nexşan/**: چاوگ. تێنەپەر. //نەخشای؛ دەنەخشێی؛ بنەخشێ// پێکهاتنی بیچم و وێنە ☰ نقش بستن

■ ئاوەلناوی بەرکاری: نەخشاو/ چاوگی نەرێنی: نەنەخشان

**نەخشاندن / nexşandin/**: چاوگ. تێپەر. //نەخشاندت؛ دەنەخشێنی؛ بنەخشێنە// نەقشاندن؛ بە ڕەنگی جوان ڕەنگاندن ‹دیسان خوێنی قارەمانێک/ نەخشاندی ڕێگای ئازادی «هێمن»› ☰ نقش و نگار زدن

■ ئاوەلناوی بەرکاری: ـــ/ چاوگی نەرێنی: نەنەخشاندن

**نەخشاندی / nexşandî/**: ئاوەلناو. نەخش‌کراو؛ نەخشاو ☰ مُنقش

**نەخشاو / nexşaw/**: ئاوەلناو. نەخشیو؛ بە ڕەنگی جوان ڕەنگاو ‹ئیستە کوڕێکی پەرچەم دەق‌دراو/ بە کلاوێکی بە حەوت ڕەنگ نەخشاو «مینەجاف»› ☰ منقوش

**نەخشبەند / nexşbend/**: ئاوەلناو. نەقشبەند؛ نیگارڤان؛ وێنەکێش؛ شێوەکێش ☰ نقشبند

**نەخشبەندی**[١] **/ nexşbendî/**: ناو. نەقشبەندی؛ مریدانی تەریقەتی نەخشبەندییە ☰ پیروان طریقت نقشبندی

**نەخشبەندی**[٢]: ئاوەلناو. نەقشبەندی؛ سەر بە تەریقەتی نەخشەبەندییە ☰ نقشبندی

**نەخشبەندییە / nexşben(i)dîye/**: ناو. نەقشبەندییە؛ لقێکی سۆفیگەرییە، سەر بە بەهائەددینی نەقشبەند (٧١٨– ٧٩١ ک. م.) کە بە سەرهەڵدانی مەولانا خالیدی کوردی

شارەزووری (١١٩٣- ١٢٤٢ک. م.)، ئەم ڕێبازە لە هەموو ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و بەتایبەت کوردستاندا، پەرەیەکی یەکجار زۆری ساند ☰ نقشبندیّه

**نەخشدار / nexşdar/**: ئاوەڵناو. نەقشدار؛ نەخشار؛ بە نەخش کراو؛ دژی ساکار ☰ مُنقش

**نەخشکراو / nexşk(i)raw/**: ☜ **نەخشاندی**

**نەخشونیگار / nexş û nîgar/**: ناو. نەقشونیگار: ١. وێنە و شکڵ پێکەوە ٢. *[مەجاز]* چۆنیەتی کار و باری ژیان ☰ ١. نقش و نگار ٢. وضع زندگی

**نەخشە / nexşe/**: ناو. نەقشە: ١. خەریتە؛ شکڵی وڵات و سەرزەمینان لە سەر کاغەز ٢. بڕیاری چۆنیەتی کردنی کارێک لە بیر و هۆشدا ☰ ١. نقشەی جغرافیایی ٢. طرح؛ نقشەی انجام کار

⊡ **نەخشە کێشان**: ١. شکڵ کێشان ٢. *[کینایە]* پیلان گێڕان ☰ ١. نقشە کشیدن ٢. توطئە چیدن

**نەخشە کێشانەوە**: دانانی شکڵی شتێک یان وڵاتێک لە سەر کاغەز ☰ نقشە کشیدن

**نەخشەڕێگا / nexşeřêga/**: ناو. پلان و ڕێگای گەیشتن بە مەبەست و ئامانجێکی تایبەت ‹نەخشەڕێگای ڕیفۆرمی ئابووری› ☰ نقشەی راه

**نەخشین / nexşîn/**: ئاوەڵناو. جوان و ڕەنگاوی ☰ دارای نقش و نگار

**نەخشیو / nexşîw/**: ☜ **نەخشاو**

**نەخفی / nexfî/**: ئاوەڵناو. زگ باکردوو؛ فووکراو ☰ بادکردە

**نەخلەش / nexleş/**: ئاوەڵناو. نەخلیایش؛ پڕبەر؛ خاوەن بەری زۆر ☰ پُربار

**نەخلیاییش / nexlyayîş/**: ☜ **نەخلەش**

**نەخوازا / nex(i)waza/**: ☜ **نەخوازە**

**نەخوازە / nex(i)waze/**: ئاوەڵکار. نەوازە؛ نمازە؛ نەخازا؛ نەخازە؛ نەخاسم؛ ناوازە؛ ناوێزە؛ نەخەسەلا؛ نەخوازا؛ نەخوازەلا؛ نەمازە؛ بەتایبەت ☰ بویژە

**نەخوازەلا / nex(i)wazeła/**: ☜ **نەخوازە**

**نەخوازیاگ / nex(i)wazyag/**: ☜ **نەخواستە**

**نەخوازیاو / nex(i)wazyaw/**: ☜ **نەخواستە**

**نەخواستە / nex(i)waste/**: ئاوەڵناو. نەخوازیاگ؛ نەخوازیاو؛ بێویست و خواستی کەسێک ☰ ناخواستە

**نەخون / nexun/**: ئاوەڵناو. لای قوون بڵند و مل نەوی (ئەسپ) ☰ کفل برجستە و گردن فروهشتە (اسب)

**نەخونجاو / nexuncaw/**: ☜ **ناجۆر[1]-١**

**نەخوەشەر / nex(i)weşer/**: ☜ **نوخۆشەر**

**نەخوەنە / nex(i)wene/**: ☜ **نەخوێندەوار**

**نەخویا / nexuya/**: ئاوەڵناو. نەدیار؛ بەرپیوار ☰ ناپیدا

**نەخوێندو / nexw(i)êndû/**: ☜ **نەخوێندەوار**

**نەخوێندەوار / nex(i)wêndewar/**: ئاوەڵناو. ناخوندە؛ نەخاندی؛ نەخوێندوو؛ نەخوێندی؛ نەخوەنە؛ نەخۆندە؛ نەخۆندی؛ نەخۆنە؛ نێوەندا؛ نێوەندە؛ بەبێ توانای نووسین و خوێندنەوە ☰ بیسواد

**نەخوێندەواری / nex(i)wêndewarî/**: ناو. بێسیواتی؛ نەوانایی ☰ بی‌سوادی

**نەخوێندی / nex(i)wêndî/**: ☜ **نەخوێندەوار**

**نەخۆ[1] / nexo/**: ئاوەڵکار. ١. دەنا؛ ئەگینا ‹نەخۆ ئەگەر من یارمەتی تۆم نەدایە، نەتدەتوانی سەر کەوی› ٢. هەروەها؛ هەر ئاوەها ☰ ١. وگرنە ٢. بە همین ترتیب

**نەخۆ[2]**: نزا. مەبادا ☰ مبادا

**نەخۆپان / nexopan/**: ئاوەڵناو. ئاوا؛ ئاوەدان ☰ آباد

**نەخۆر / nexor/**: ئاوەڵناو. نەخۆرم: ١. تایبەتمەندی کەس یان گیانداری کە ناخوا ٢. *[کینایە]* چکووس؛ ڕژد و لەچەر ‹ماڵی نەخۆر هی بخۆرە! «مەسەل»› ☰ ١. ویژگی شخص یا جانداری کە نمی‌خورد ٢.

خسیس

**نەخۆرم** / nexorim/: ☜ **نەخۆر**

**نەخۆش**[١] / nexoş/: ناو. ناخۆش؛ ناساخ؛ ناساز؛ ناساغ؛ ناساق؛ نەساخ؛ نەساز؛ نەساغ؛ نەوەسە؛ نەوەش؛ نیوەس؛ نیوەش؛ گیانداریّ کە بڕیّک لە ئەندامەکانی لەشی تووشی گرفت هاتوون ‹نەخۆشێکیان هێنابوو، خوێن دەڕشاوە› ☲ بیمار

**نەخۆش**[٢]: ئاوەڵناو. ناخۆش؛ ناساخ؛ ناساز؛ ناساغ؛ ناساق؛ نەساخ؛ نەساز؛ نەساغ؛ نەوەسە؛ نەوەش؛ نیوەس؛ نیوەش؛ تووشی نەخۆشی بوو ‹ئاغای ڕەئیس! قەرزدارم / نەخۆشم، برسیم، هەژارم «مەلا ئاوارە»› ☲ بیمار

◻ **نەخۆش بوون**: ١. ☜ **نەخۆش کەوتن** ٢. لە دۆخی ناساغیدا بوون ☲ ١. ☜ **نەخۆش کەوتن** ٢. بیمار بودن

**نەخۆش خستن**: تووشیاری نەخۆشی کردن ‹دەردی عیشقی تۆ نەخۆشی خستوم هاتوومە مەرگ/ نەک ئەجەل موهڵەت نەدا با تاویّ بتبینم وەرە «حەیدەریی مەهابادی»› ☲ بیمار کردن

**نەخۆش کەوتن/ کەفتن**: نەخۆش بوون؛ تووشی ناساغی هاتن ‹لە ساڵی ١٩٨٦دا تەواو نەخۆش کەوتم. کەوتە بیرم کە بۆچی تا ماوم کارێک دەگەڵ مەم و زینی خانی نەکەم؟ «هەژار، چێشتی مجێور»› ☲ بیمار شدن

**نەخۆشخانە** / nexoşxane/: ناو. خەستەخانە؛ تیمارخانە؛ دامەزراوەیەک بە ئامراز و کەرستە و کارگێڕانی تەیار بۆ ڕاگرتن و دەرمانی نەخۆشان ☲ بیمارستان

◻ **نەخۆشخانەی پسپۆڕیی**: خەستەخانەیەک کە بۆ دەرمانی بڕێک نەخۆشینی تایبەتیی تەرخان کراوە ☲ بیمارستان تخصصی

**نەخۆشخانەی تایبەتی**: خەستەخانەی نادەوڵەتی ☲ بیمارستان خصوصی

**نەخۆشخانەی دەوڵەتی**: نەخۆشخانەی حوکمی؛ خەستەخانەی سەر بە دەوڵەت ☲ بیمارستان دولتی

**نەخۆشخانەی ڕەوانیی**: خەستەخانەی تایبەت بە نەخۆشینی سەر بە ڕەوان و هزرەوە ☲ بیمارستان روانی

**نەخۆشەر** / nexoşer/: ☜ **نوخۆشەر**

**نەخۆشی** / nexoşî/: ناو. ناخۆشی؛ ناخۆشین؛ ناساخی؛ ناساغی؛ ناساقی؛ نەخۆشین؛ نەساخن؛ نەساخی؛ نەساغی؛ نیوەسانی؛ نیوەشانی؛ نیوەشەن؛ نیوەشەی؛ نیوەشی؛ نیوەشییە؛ نیوەشینە؛ لەش‌بەباری ‹پێی‌وتم: ڕۆڵە! هەوای زار و نزار/ هەیەتی دەرد و نەخۆشی بە هەزار «سوارە»› ☲ بیماری

◻ **نەخۆشی چەتوون**: نەخۆشینیّ کە چا بوونەوەی دژوار بیّ ☲ بیماری صعب‌العلاج

**نەخۆشی گیرۆ**: نەخۆشینیّ کە زوو بڵاو دەبێتەوە ☲ بیماری واگیردار

**نەخۆشین** / nexoşîn/: ☜ **نەخۆشی**

**نەخۆندە** / nexonde/: ☜ **نەخوێندەوار**

**نەخۆندی** / nexondî/: ☜ **نەخوێندەوار**

**نەخۆنە** / nexone/: ☜ **نەخوێندەوار**

**نەخو** / nexû/: ئاوەڵکار. ئەدیّ؛ ئەی چیّ؛ کە وا بیّ ☲ پس؛ کە این طور

**نەخوس** / nexûs/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندیی هەر شتیّ لە ئاودا نەخووسیّ و نەرم نەبێتەوە ☲ ویژگی هرچه که در آب خیس نخورد

**نەخەسەلا** / nexesela/: ☜ **نەخوازە**

**نەخێر** / nexêr/: ئاوەڵکار. نە؛ نەئا ☲ نە؛ خیر

**نەد** / ned/: ناو. نیاز؛ نەزر؛ نزر ☲ نذر

**نەدار** / nedar/: ئاوەڵناو. بیّ‌ماڵ؛ دەستەنگ؛ بەلەنگاز؛ فەقیر ☲ فقیر

**نەداری** / nedarî/: ناو. بیّ‌ماڵی؛ دەستەنگی ☲ فقر

**نەدامەت** / nedamet/: ☜ **نەگبەت**

**نەدان** / nedan/: ئاوەڵناو. بێئاوەز ▤ نادان

**نەدر** / nedr/: ☜ **نەزر**

**نەدویر** / ned(i)wîr/: ☜ **نزیك**

**نەدوێن** / ned(i)wên/: ئاوەڵناو. نەدوو؛ کەمقسە ▤ کمحرف

**نەدو** / nedû/: ☜ **نەدوێن**

**نەدور** / nedûr/: ☜ **نزیك**

**نەدیار** / ned(i)yar/: ئاوەڵناو. نەخویا؛ بەرپیوار؛ نەئاشکرا؛ نادیار ▤ ناپیدا

**نەدیاری** / ned(i)yarî/: ناو. نادیاری؛ گومی ▤ ناپیدایی

**نەدیبدی** / nedîb(i)dî/: ئاوەڵناو. *[ئەڕ]* نەدیوبدی؛ نەیبی؛ نەیوی؛ نەوبی؛ نەیوەی؛ تیکل؛ بە هەڵپەهەڵپ و چاوچنۆکی زۆرەوە لە ئاست شتی تازە و خۆش ▤ ندیدبدید

**نەدیتبار** / nedîtbar/: ئاوەڵناو. نەبانۆک؛ خۆ بویر؛ خۆوەشێر لە ئەرک ▤ اهمال‌کار

**نەدیتە**[1] / nedîte/: ناو. نەدیدە؛ نەییە؛ نەوەی نەتیجە ▤ ندیده؛ فرزند نبیره

**نەدیتە**[2]: ئاوەڵکار. نەدیو؛ نەدیدە؛ نەییە؛ نەبینە؛ کاری کڕین و فرۆشتنی بێ دیتن ‹نەدیتە بە چەند؟› ▤ ندیده

**نەدیدە** / nedîde/: ☜ **نەدیتە**

**نەدیر**[1] / nedîr/: ناو. ئاگری سەرچیا بۆ خەبەر بە خەڵک دان ▤ آتش اعلام خبر بر فراز کوەها

**نەدیر**[2]: ئاوەڵکار. زوو؛ بەم زوانە ▤ به زودی

**نەدیگ** / nedîg/: ☜ **نەدیو**

⊡ **نەدیگ و نەناس**: بە بێ هێچ ئاشنایەتییەک لە پێشدا ‹خوا خەیری با؛ نەدیگ و نەناس سوارمانی کرد و گەیاندمانی› ▤ بدون آشنایی قبلی

**نەدیو**[1] / nedîw/: ئاوەڵناو. نەبینراو؛ نەدیگ؛ گوم لە بەر چاو ‹لە شوێنێکی نەدیو هەڵچەقیبوو› ▤ دیده نشده

**نەدیو**[2]: ئاوەڵکار. نەبینراو؛ نەدیتە؛ نەدیگ؛ بە بێ چاو پێ کەوتن ‹قەن نەدیو مامەڵە مەکە!› ▤ نادیده

ـ **نەدیو**[3]: پاشوشە. نەدیتوو ‹دۆنەدیو؛ خۆرنەدیو؛ خێرنەدیو› ▤ ـ ندیده

**نەدیوبدی** / nedî w b(i)dî/: ☜ **نەدیبدی**

**نەر**[1] / ner/: ناو. سووچ؛ قوژبن ▤ گوشه؛ نبش

**نەر**[2]: ئامراز. نک؛ جەم ▤ نزد

ـ **نەر**[3]: پاشگر. ـ دانەر؛ نیەر ‹بنیاتنەر؛ وەدەرنەر› ▤ ـ نِه

**نەربەند** / nerbend/: ناو. مرمەند؛ سوان ▤ سوهان

**نەرپێچ** / nerpêç/: ناو. مارپێچ قلیان ▤ مارپیچ قلیان

**نەرچ** / nerç/: ☜ **نرکە**

**نەرچە** / nerçe/: ☜ **نرکە**

**نەرخ** / nerx/: ☜ **نرخ**

⊡ **نەرخ دان**: درکاندنی قیمەت؛ گوتنی بایی ▤ نرخ چیزی را گفتن

**نەرخ دانان**: ☜ **نرخ دانان**

**نەرد** / nerd/: ناو. تەختەنەرد؛ تاوڵە؛ تاوڵی؛ گەمەی تاوڵی ‹چەپگەرد فرسەتباز شانا مۆرەی نەرد/ عومرێ بی ئاما و ویەرد، گوزەر کەرد «مەولەوی»› ▤ نرد

**نەردان** / nerdan/: ☜ **نەردێن**

**نەردانێ** / nerdanê/: ☜ **نەردێن**

**نەردونگ** / nerdung/: ☜ **نەردیوان**

**نەردە** / nerde/: ناو. ١. لاجامە (ئی بەرهەیوان)؛ مێردڕەوە (لێواری بان)؛ دەرەج؛ تەختەبەن؛ محەجەری؛ محەجەرە؛ مەعجەرە؛ شیشەبەند؛ تەلبەند؛ پێکهاتەیەک لە ڕزنێ میلەی چێوی یان کانزایی کە لە سەر و خوارەوە بە دوو میلەی درێژ داکشاو گیردراون بۆ پەرانپەری سەربان یان

پەنای پلیکان و... ٢. ☜ **نەردیوان** ■ ١. نرده ٢. ☜ **نەردیوان**

**نەردەوان / nerdewan/:** ☜ **نەردیوان**

**نەردەوانێ / nerdewanê/:** ناو. پەیژە؛ پەیجە؛ پەینجە ■ نردبام

**نەردیوان / nerdîwan/:** ناو. ناردانی؛ ناردیوان؛ نەردونگ؛ نەردە؛ نەردەوان؛ نێردیوان؛ پەیژە؛ سلەم؛ پەیجە؛ پەینجە؛ کەرستەیەکی لە چێو یان کانزا بۆ پێدا هەڵگەڕان و دابەزین ■ نردبام

**نەردێن / nerdên/:** ناو. نەردان؛ نەردانێ؛ کایە بە تەختەنەرد ■ نردبازی

**نەرگز / nergiz/:** ☜ **نێرگز**

**نەرگزجاڕ / nergizcař/:** ☜ **نێرگزەجاڕ**

**نەرگزە / nerg(i)ze/:** ناو. نەرگسە؛ نێرگزە: ١. قیتکەی ناو زێی ماین کە جاران دەیانبڕی ٢. کلێنچکەی سەر دوگی پەز ■ ١. ذُکمەی فرج مادیان ٢. دنبالچەی روی دُنبه

**نەرگزی / nerg(i)zî/:** ☜ **نێرگزی**

**نەرگس / nergis/:** ☜ **نێرگز**

**نەرگسجاڕ / nergiscař/:** ☜ **نێرگزەجاڕ**

**نەرگسە / nerg(i)se/:** ☜ **نەرگزە**

**نەرگسەجاڕ / nerg(i)secař/:** ☜ **نێرگزەجاڕ**

**نەرگسی / nerg(i)sî/:** ☜ **نێرگزی**

**نەرگیلە / nergîle/:** ☜ **نێرگەلە**

**نەرم[1] / nerm/:** ئاوەڵناو. نەمر؛ نەرمژ: ١. هۆک؛ بە تایبەتمەندی نووشتانەوەی زۆرەوە ‹قوماشی نەرم› ٢. نارەق ‹دۆشەکی نەرم› ٣. لووس؛ هلوولس؛ ساف؛ ناسک و شلک ‹پێستی نەرم› ٤. */مەجاز/* نەرمونیان؛ نازک؛ مەلاهیم؛ بەبێ توندی و توورەیی ‹دەنگی نەرم› ■ ١تا٤. نرم

▣ **نەرم بوون:** ١. لە ڕەقی تەکینەوە ٢. */کنایە/* ڕازی بوون؛ پێمل بوون ‹دڵی نەرم بوو› ■ ١. نرم شدن ٢. راضی شدن

**نەرم کردن/ کرن:** ١. نەرمژاندن ٢. ڕام کردن؛ ڕازی کردن ■ ١. نرم کردن ٢. قانع کردن

**نەرم هژاندن:** */کنایە/* ڕازی کردن و هێنانە ڕەدا بە پێهەڵگوتن ■ راضی کردن با مدح و ثنا گفتن

**نەرم[2]:** ئاوەڵکار. هێواش؛ بە ئارامی ‹نەرم بیشێلە؛ نەرم برۆ› ■ آهسته

**نەرمان[1] / nerman/:** ☜ **نەرمانی**

**نەرمان[2]:** ئاوەڵناو. نەرم و بێبەرد و کلۆ (زەوی) ‹ئەو پارچە زەوییە نەرمانە› ■ بی سنگ و کلوخ (زمین)

**نەرمانی / nermanî/:** ناو. نەرمان؛ زەوینی بێبەرد و لە کێلان خۆش ■ زمین نرم و هموار

**نەرمایی / nermayî/:** ناو. شوێنی نەرم ‹نەرمایی گوێ› ■ نرمی

**نەرمژ / nermij/:** ☜ **نەرم[1]**

**نەرمژاندن / nerm(i)jandin/:** چاوگ. نەهێشتنی ڕەقی شتێ ■ نرم کردن شیء سخت

**نەرمژین / nerm(i)jîn/:** چاوگ. نەرم بوونی ڕەق ■ نرم شدن شیء سخت

**نەرمک / nermik/:** ☜ **نەرمۆك**

▣ **نەرمکا سەر:** بان مەلاشوو ■ آهیانه

**نەرمکا گۆهێ:** شلکەی گوێ ■ لالەی گوش

**نەرمکێش / nermkêş/:** ئاوەڵناو. تایبەتمەندی بنیادەمی بە سەبر و پشوو لەسەرخۆ ■ مُداراکننده

**نەرمکێشی / nermkêşî/:** ناو. نەرمونیانی؛ پشوودرێژی؛ مدارا ■ مُدارا

**نەرموشل / nerm û şil/:** ئاوەڵناو. ١. شلومل؛ لەشنەرم ٢. */مەجاز/* بە حەوسەلە ■ ١. طنّاز ٢. بُردبار

**نەرمونۆڵ / nerm û noł/:** ئاوەڵناو. نەرم و ناسک ‹ئەی بەرخۆڵەکە! نەرمونۆڵەکە!/ سپی و خڕێنی وەک کولووی لۆکە! «گۆران»› ■ نرم و لطیف

**نەرمونیان[1] / nerm û n(i)yan/:** ئاوەڵناو. ١. بە سەبر و حەوسەلە ‹پیاوێکی نەرمونیانە› ٢. خۆش؛

نەرم ‹بە زمانێکی نەرمونیان بیاندوێنە «هەژار، قورئان»› ٣. شلومل؛ لەشنەرم ‹باڵای نەرمونیان› 🇮🇷 ١. باحوصله ٢. نرم ٣. طنّاز

**نەرمونیان**[٢]: ئاوەڵکار. بە ئارامی؛ بە حەوسەلە ‹لە حاندی خاوەن باوەڕان نەرمونیان دەبزووتنەوە و لە بەرانبەر دیندوژمنان، سەربلند و توند و تیژن «هەژار، *قورئان*»› 🇮🇷 بە نرمی

**نەرمونیانی** / nerm û n(i)yanî/: ☜ **نەرمکێشی**

**نەرمۆ** / nermo/: ئاوەڵناو. ناتۆ؛ نانخۆری بێکارە 🇮🇷 مُفتخور

**نەرمۆک** / nermok/: ئاوەڵناو. نەرمک؛ نەرمە؛ بێپێشە 🇮🇷 لُخم؛ بی‌استخوان

**نەرمۆڵ** / nermoł/: ئاوەڵناو. نەرم و چکۆلەی دڵگر 🇮🇷 نرم و ناز

**نەرمۆڵە** / nermołe/: ئاوەڵناو. پچکۆلەی نەرم 🇮🇷 نرم و کوچولو

**نەرمو** / nermû/: ئاوەڵناو. بە حەوسەلە؛ پشوولەسەرخۆ 🇮🇷 شکیبا؛ بُردبار

**نەرمە**[١] / nerme/: ناو. ١. شلکەی گوێ ٢. هەوایەک بە بلوێر ٣. گۆشتی بێپێشە ‹کوتە گۆشتێکی نەرمەی زلی هێنابوو› ‹ئەچی گۆشت بسێنی، کیلوێک پێشە و نیم کیلۆ نەرمە بسێنە!› 🇮🇷 ١. نرمەی گوش ٢. نوایی کە با نی می‌نوازند ٣. گوشت راستە

**نەرمە**[٢]: ئاوەڵناو. ١. ☜ **نەرمۆک** ٢. شلومل؛ لەشنەرم ٣. تایبەتمەندی گۆشتی بێ ئێسقان ‹کوتە گۆشتێکی نەرمەی زلی هێنابوو› 🇮🇷 ١. ☜ **نەرمۆك** ٢. طنّاز ٣. نرمە؛ بی‌استخوان (گوشت)

**نەرمەبا** / nermeba/: ناو. سروە؛ شنە؛ شنەبا 🇮🇷 نسیم

**نەرمەباران** / nermebaran/: ناو. ڕەشێش؛ وردەباران 🇮🇷 نم ـ نم باران

**نەرمەبڕ** / nermebiř/: ئاوەڵناو. زارنەرم؛ دەمتەڕ؛ زمانلووس ‹لە ژێرەوە نەرمەبڕ، لە سەرەوە سارد و سڕ› 🇮🇷 چرب‌زبان

**نەرمەبەدۆ** / nermebedo/: ناو. دڕوولە؛ وەستامستەفا؛ گیادۆکوڵیوێکە درووی پێوەیە 🇮🇷 نوعی گیاه خاردار برای آش دوغ

**نەرمەبێژ**[١] / nermebêj/: ناو. ئاڵەبێژ؛ پارچەی تەنک و شاش 🇮🇷 بیزن پارچەای

**نەرمەبێژ**[٢]: ئاوەڵناو. دابێژراو بە پارچەی شاش 🇮🇷 بیختە با پارچەی بیزن

**نەرمەتۆز** / nermetoz/: ناو. تۆز و غوماری نەرم 🇮🇷 گرد و غُبار بە مقدار کم

**نەرمەزین** / nermezîn/: ناو. نمەدزین؛ ئارەقگیری بن زین 🇮🇷 نمدزین

**نەرمەساو** / nermesaw/: ناو. ١. پۆڵای چەقۆ تیژ کردن ٢. قۆناغێک لە بانەناو کردن 🇮🇷 ١. پولاد چاقو تیزکنی ٢. مرحلەای از بام‌اندود

**نەرمەغار** / nermeğar/: ناو. نەرمەهەڵۆ؛ غاری لەسەرخۆ 🇮🇷 چهارنعل سبک

**نەرمەقووت**[١] / nermeqût/: ناو. ١. کاری باش جاوینی خۆراک ٢. دۆخی ئاسان قووت دانی پاروو 🇮🇷 ١. عمل خوب جویدن خوراک ٢. حالت آسان بلعیدن لقمە

**نەرمەقووت**[٢]: ئاوەڵناو. بە تایبەتمەندی سانا قووت درانەوە ‹ڕەحەتەلقوم نەرمەقووتە› 🇮🇷 نرم و روان در بلعیدە شدن

**نەرمەک** / nermek/: ئاوەڵناو. نەرمونۆڵ و هێندێک قەڵەو (ژن) 🇮🇷 نرم و لطیف و اندکی چاق (زن)

**نەرمەکاری** / nermekarî/: ☜ **نازککاری ـ٢**

**نەرمەکۆکە** / nermekoke/: ناو. کۆکەی سەبر و ئارام 🇮🇷 سُرفەی نرم و آهستە

**نەرمەگا** / nermega/: ناو. زەوی خۆشکراو؛ چەندهێشە 🇮🇷 زمین چندبار شخم‌زدە

**نەرمەگاو** / nermegaw/: ☜ **نەرمەلۆت**

**نەرمەگوێ** / nermegiwê/: ناو. بەلک؛ چیچیلە؛ گووهوک ☰ نرمەی گوش

**نەرمەلۆت** / nermelot/: ناو. نەرمەگاو؛ شەقاوی بچووک و لەسەرخۆ ☰ گام‌های نرم و آرام

**نەرمەلۆق** / nermeloq/: ناو. لۆقی سەبرۆکە و لەسەرخۆ ☰ هَروله‌ی آرام

**نەرمەلیقە** / nermelîqe/: ئاوەڵناو. لیچق؛ لینج ☰ لزج

**نەرمەناسە** / nermenase/: ناو. نەرمە هەناسەی مرۆڤی خەوتوو ☰ نفس‌های آرام شخص خوابیده

**نەرمەنایە** / nermenaye/: ناو. تووتەک ☰ نوعی نی زبانه‌دار

**نەرمەنەرم** / nermenerm/: ☜ **نەرمەنەرمە**

**نەرمەنەرمە** / nermenerme/: ئاوەڵکار. نەرمەنەرم؛ کەم کەمە و بە سەبر ‹نەرمەنەرمە گیا سەر لە خاک دەردێنێ› ☰ نرم‌نرمک

**نەرمەنیشک** / nermenîşk/: ئاوەڵناو. لەبار و شیاو ☰ شیک و مُرتب

**نەرمەهەڵۆ** / nermeheło/: ☜ **نەرمەغار**

**نەرمهاژۆک** / nermhajok/: ئاوەڵناو. نەرمونیان ☰ صبور و آرام

**نەرمی** / nermî/: ناو. ١. دۆخێکی ماکە دژی سفت ٢. *[مەجاز]* پشوودرێژی؛ دۆخی میهرەبان و سازگار بوون لەگەڵ دیتران ‹نەرمی نواندن› ☰ ١و٢. نرمی

**نەرمیچانک** / nermîçanik/: ئاوەڵناو. زۆر نەرم ☰ بسیار نرم

**نەرمیلێ** / nermîlê/: ناو. پێچە؛ پێچن؛ پێچی ☰ گیاه سداب

**نەروم** / nerum/: ئاوەڵناو. ١. بێ‌فەڕ؛ سووک و چرووک ٢. لە خۆبایی؛ بادی‌هەوا ☰ ١. بی‌اخلاق و پست ٢. مغرور؛ خودخواه

**نەرۆک**[1] / nerok/: ناو. لقی ناوەڕاستی گیا ☰ نره؛ ساقه‌ی اصلی گیاه

**نەرۆک**[2]: ئاوەڵناو. مەمک داشۆڕاو ☰ دارای پستان افتاده

**نەروو** / nerû/: ☜ **نێرتك ـ١**

▣ **نەرووپیانزێ:** نێرتکە پیواز؛ ئەو لقە لە پیاز کە تۆمی تێدایە ☰ نره‌ی پیاز سبز

**نەرە** / nere/: ناو. ١. داربەڕووی زل ٢. زمانەی تەرازوو ☰ ١. بلوط تنومند ٢. شاهین ترازو

**نەریت**[1] / nerît/: ناو. ١. خدە؛ خوو؛ ئاکار ٢. دابودەستوور؛ ڕەسم و یاسا؛ ڕێ وشوێنی باو و پەسندکراوی ناو کۆمەڵگا ‹داب و نەریتی ئەم وڵاتە تایبەتە› ٣. شێوە؛ ڕێسا؛ دەستووری پەسن‌کراو بۆ کار یان کردەوەیەک ‹نەریتی بەشدار بوون؛ نەریتی دەست لە کار کێشانەوە› ☰ ١. خوی؛ روش ٢. عُرف ٣. راه و رسم

**نەریت**[2]: ئاوەڵناو. تازەداهاتوو ☰ نوین

**نەریس** / nerîs/: ☜ **نێرگز**

**نەرینک** / nerînik/: ناو. قەوات؛ ئاکار؛ خۆ؛ خوو ☰ خوی؛ خُلق

**نەرێ** / nerê/: ئاوەڵکار. نە؛ نەخێر ☰ نه؛ خیر

**نەرێسات** / nerêsat/: ئاوەڵناو. نە بە ئاشکرا و ڕەپ و ڕاست ☰ غیرصریح

**نەرێساتی** / nerêsatî/: ناو. کینایە؛ پەردەک ☰ کنایه

**نەرێسەڵە** / nerêsele/: ☜ **نێرگزەجاڕ**

**نەرێن** / nerên/: ئاوەڵناو. دژ؛ نەیار ☰ مُخالف؛ ضد

**نەرێنی**[1] / nerênî/: ناو. دژایەتی؛ دژمەنی ☰ مُخالفت؛ ضدیّت

**نەرێنی**[2]: ئاوەڵناو. بە تایبەتمەندی دژبەرانەوە؛ دژ بە ئامانجی خوازراو و چاوەڕوان‌کراو ‹وەرامی نەرێنی› ☰ منفی

**نەڕ**[1] / neř/: ناو. ١. نێر؛ پێچەوانەی مێ ٢. ڕەگەزێکی وشتر ☰ ١. نر ٢. نوعی نژاد شُتُر

**نەڕ**[2]: ئاوەڵناو. نێر؛ بەرامبەری مێ ‹شیری نەڕ› ☰

نر

**نەڕاست**[1] / neřast/: ناو. درۆ؛ فشە؛ چاخان ☰ دروغ

**نەڕاست**[2]: ئاوەڵناو. ١. خـوار؛ لار؛ چـەوت؛ گێـڕ ٢. *[کینایە]* درۆزن؛ فشەکەر ☰ ١. کج ٢. دروغگو

**نەڕاستەڕێ** / neřasteřê/: ئاوەڵناو. نە بـە ئاشـکرا و ڕووبەڕوو ☰ غیرمستقیم

**نەڕاستی**[1] / neřastî/: ناو. خەیانەت ☰ خیانت

**نەڕاستی**[2]: ئاوەڵناو. زڕە؛ سهر؛ بەدەل ☰ بَدَل

**نەڕاستی**[3]: ئاوەڵکار. بەگاڵتە؛ بە شـۆخییەوە ☰ بـە شوخی

**نەڕان** / neřan/: چاوگ. ١. قیڕانـدن؛ نەڕانـدن ٢. دەنگی بەرز و قۆڕ دەرهێنـان ☰ ١. غُریـدن ٢. داد کشیدن

**نەڕانـدن** / neřandin/: چـاوگ. تێپـەڕ. //نەڕانـدت؛ دەنەڕێنی؛ بنەڕێنە// نەڕانن؛ گوڕاندن ☰ غُریدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ــ/ چاوگی نەرێنی: نەنەڕاندن

**نەڕانن** / neřanin/: ☜ **نەڕاندن**

**نەڕچە** / neřçe/: ناو. بەچکە وشـتری نێـر ☰ بچـە شتر نر

**نەڕڕ** / neřř/: ناو. نـەڕڕە: ١. ناوەڕاسـت (شـان) ٢. سەر؛ بان (شان) ☰ ١. وسط (شانەها) ٢. بالا (شانەها)

**نەڕڕە**[1] / neřře/:. ☜ **نەڕڕ**

▣ **نەڕڕەی پشت**: ناوەڕاستی شان ☰ وسط شانەها

**نەڕڕەی شان**: سەر شـان ‹دارەکـەی نـابووە سـەر نەڕڕەی شانی› ☰ بالای کتف

**نەڕڕە**[2]: پێشوشـە. نێری دڕنـدە و دێـو ‹نـەڕڕە شـێر؛ نەڕڕە دێو› ☰ نرینەی درندە و دیو

**نەڕڕە**[3]: دەنگەناو. نارەتە؛ گـوڕە ‹نـەڕڕە مەکـە!› ☰ نعرە

**نەڕما** / neřma/: ☜ **نێرومێ**

**نەڕمادە** / neřmade/: ☜ **نێرومێ**

**نەڕنـایش** / neřnayş/: نـاو. ١. دڵـەدێو ٢. *[کینایە]* ژنی زەبەلاحی ناقۆلا ☰ ١. دلەدیو ٢. زن لندهور

**نەڕند** / neřind/: ئاوەڵناو. ١. خراو؛ خراپ؛ نـەباش ٢. ناشیرین؛ ناحەز ☰ ١. ناپسند ٢. بدشکل

**نـەڕنـەڕەشـێر** / neřneřeşêr/: ئاوەڵـناو. *[مـەجاز]* زەبەلاحی مرۆترسێن ☰ لندهور سهمناک

**نەڕوما** / neř û ma/: ☜ **نێرومێ**

**نـەڕۆک** / neřok/: ئاوەڵـناو. وشـک؛ بـێجووڵـە ☰ ساکن

**نـەڕۆنـەبار** / neřonebar/: ئاوەڵناو. ١. نەشـیاو بـۆ دیتن ٢. جێ گومان ☰ ١. نامناسبِ دیدن ٢. جـای گُمان

**نەڕە** / neře/: نـاو. نەلاتە: ١. گوڕەی دڕندە؛ نارەتە ٢. نەڕڕە ☰ ١. غُرّش حیوان درندە ٢. نعرە

▣ **نەڕەی دێو**: نارەتەی دێو ☰ نعرەی دیو

**نەڕەسیو** / neřesîw/: ☜ **نەگەیشتو**

**نەڕەوا** / neřewa/: ☜ **ناڕەوا**

**نەڕەیی** / neřeyî/: ناو. نێریەتی؛ نێرایەتی ☰ نری

**نـەڕیمـایکی** / neřîmaykî/: ئاوەڵـناو. نێرەمـووک؛ ئێرەمووک ☰ نرموک؛ نر ـ مادە

**نەز** / nez/: ☜ **نز**[1]**ـ١**

**نەزا** / neza/: ☜ **نەزۆک**

**نەزاکە** / nezake/: ناو. چـاوەڕوانی؛ چەمـەڕایی ☰ انتظار

**نەزاکەت** / nezaket/: نـاو. لەسەرخۆیی و پەسندی ‹وە سەد نەزاکەت دەهەن واز مەکەرد/ وە یـەک نـاز ئیزهار سەد نیاز مەکەرد «حەریق»› ☰ ادب

**نەزان**[1] / nezan/: ☜ **زان**[1]

**نەزان**[2]: ئاوەڵناو. بێئاوەز ‹بەردێ کە نەزان بیخاتە ناو ئاو/ دەر نایە بە سەد عاقڵـی تـەواو «پیرەمێـرد»› ☰ نادان

**نەزانـدراو** / nezand(i)raw/: ئاوەڵـناو. نـەزانراو؛ فێمنەکری ☰ درکنشدە

**نەزاندوو** / nezandû/: ئاوەڵناو. قۆڕبێژ؛ کاوێژکەر ☰ ژاژخا

**نەزانراو** / nezanraw/: ☜ **نەزاندراو**

**نەزانست** / nezanist/: ئاوەڵکار. لە ڕووی بێئاگاییەوە ☰ اشتباهاً

**نەزانستە** / nezaniste/: ئاوەڵکار. لە ڕووی نەزانینەوە ‹نەزانستە قسیە مەکە!› ☰ ندانسته

**نەزانمکار** / nezanimkar/: ئاوەڵناو. زانای خۆ گێل‌کەر ☰ مُتجاهل

**نەزانمکاری** / nezanimkarî/: ناو. کاری خۆ بە نەزان ناساندن ☰ تجاهُل

**نەزانی** / nezanî/: ناو. بلحی؛ گەوجی ☰ ابلهی؛ نادانی

**نەزانکار** / nezankar/: ئاوەڵناو. ناشی؛ پێچەوانەی کارامە. هەروەها: **نەزانکاری** ☰ ندانم‌کار

**نەزایی** / nezayî/: ☜ **نەزۆکی**

**نەزدیک** / nezdîk/: ☜ **نزیك**

**نەزر** / nezr/: ناو. نزر؛ نەدر ☰ نذر

**نەزگرە** / nezg(i)re/: ☜ **نزگەرە**

**نەزڵە** / nezłe/: ☜ **نزڵە**

**نەزم** / nezm/: ناو. ١. جۆر؛ تەرز ‹سێ نەزم هەڵدەپەڕم› ٢. تەکووزی؛ ڕێکوپێکی ٣. نەبز؛ پلدانی ڕەگ ٤. بەزم؛ هەوای گۆرانی یان هەڵپەڕکێ ‹نەزمێ لە گۆرانییە کۆنەکان› ☰ ١. طور ٢. نظم ٣. نبض ۴. آهنگ ترانه یا رقص

**نەزۆک** / nezok/: ئاوەڵناو. نەزا؛ نەزێ؛ نەزووک؛ مەزا؛ زک‌نەکەر؛ خەش؛ ئەستێور؛ بێبەر؛ بێتوانست و لێهاتوویی باردار بوون ☰ نازا

**نەزۆکی** / nezokî/: ناو. نەزایی؛ ئەستێوری؛ خرشی ☰ نازایی

**نەزووک** / nezûk/: ☜ **نەزۆك**

**نەزە** / neze/: ناو. ڕووداوی ناخۆش؛ قەزا و بەلا ☰ قضا و بلا

**نەزەر** / nezer/: ناو. ١. بیر؛ بڕوا ‹نەخشی نامەی قەڵەمی قودرەتی ئیبداعی وجوود/ زشتی تێدا نییە گەر تۆ نەزەرت زیبا بێ «حەریق»› ٢. کاری تەماشای یەکتر کردنی نامەحرەم ☰ ١و٢. نظر

▣ **نەزەر (لێ) خستن:** نفووسی گەن دان لە شتێ یان کەسێ ☰ نفوس بد زدن نسبت به کسی یا چیزی

**نەزەر دان:** بیر و ڕا دەربڕین ☰ نظر دادن

**نەزەر گرتن:** داوای بیر و ڕا دەربڕین کردن ☰ نظرخواهی کردن

**نەزەرباز** / nezerbaz/: ئاوەڵناو. چاوباز؛ چاوچلێس؛ تۆلاز. **نەزەربازی** ☰ چشم‌چران

**نەزەرگە** / nezerge/: ناو. نزرگە؛ جێگای لێ بوونی چاکانی خوا ‹گۆڕی هەر ئیمامزادەیەک، بارەگای هەر شێخ‌زادەیەک، شەخس، نەزەرگە، قسنەکۆن ـ ڕاست یا درۆن ـ جێ چلدانە و نیازمانن، پێکهێنەری داخوازمانن! «هەژار، *چوار ناميلکه*»› ☰ آرامگاه اولیاء

**نەزیرە** / nezîre/: ☜ **نەزیلە**

**نەزیک** / nezîk/: ☜ **نزیك**

**نەزیلە** / nezîle/: ناو. نەزیرە؛ چیرۆکی کورت ☰ قصه

**نەزێ** / nezê/: ☜ **نەزۆك**

**نەژاخ** / nejax/: ☜ **نەجاخ**

**نەژاد**[1] / nejad/: ناو. ڕەسەن؛ ڕەچەڵاک؛ بنچینە ☰ نژاد

**نەژاد**[2]: ئاوەڵناو. ژاکاو؛ سیس ☰ پژمُرده

**نەژادپەرست** / nejadperist/: ناو. ڕەگەزپەرست ☰ نژادپرست

**نەژاڕ** / nejař/: ☜ **نەجاڕ**

**نەژخۆ** / nej(i)xo/: ئامراز. نیشخۆ: ١. ئەدی چۆن ٢. ئەی چۆن؛ بەڵێ وایە ٣. نەخۆ؛ نەئیتر ☰ ١. چطور ٢. بله؛ البته ٣. نه دیگر

**نەژد** / nejd/: ناو. ١. قرچی؛ قرچاوی؛ چرچی ٢. تالان؛ پووڕ ☰ ١. چروکیدگی ٢. تاراج

**نەژدڤان** / nejdvan/: ناو. تالانچی؛ پووڕکەر ☰

چپاولگر؛ غارتگر

**نەژدە** / nejde/: ☜ **نژدە**

**نەژدی**[١] / nejdî/: ناو. ماڵی تالانی ☰ مال یغمایی

**نەژدی**[٢]: ☜ **نزیك**

**نەژدینێ** / nejdînê/: ئاوەڵناو. نەهێژا؛ بێ کەڵک ☰ بی‌ثمر؛ بی‌فایده

**نەژرنایش** / nejrnayîş/: چاوگ. ١. خـۆ جـوان کردن؛ خـۆ ڕازاندنـەوە ٢. ڕازانـەوە ☰ ١. خـود را آراستن ٢. آراستن

**نەژگاڤ** / nejgav/: ☜ **نشکاڤ**

**نەژناس** / nejnas/: ☜ **نەناس**

**نەژنەو** / nejnew/: ناو/ ئاوەڵناو. گوێ کـپ؛ کـەڕ ☰ کر؛ ناشنوا

**نەژنەوا**[١] / nej(i)newa/: ناو. نەژنەو؛ کەڕ؛ نـەبیس؛ کەسێ کە دەنگ نابیسێ ☰ ناشنوا

**نەژنەوا**[٢]: ئاوەڵـناو. ١. کـەڕ؛ گـوێ کـپ؛ بـە بـێ هەسـتی بیسـتن ٢. گـوێ‌نـەگر؛ گـوێ‌نـەبیس؛ بێ‌گوێچکە ☰ ١. ناشنوا ٢. حرف‌نشنو

**نەژنەوایی** / nej(i)newayî/: نـاو. ١. کـەڕی ٢. *[مەجاز]* گوێ‌نەبیسی ☰ ١. ناشنوایی ٢. حرف‌نشنوی

**نەژی** / nejî/: ئاوەڵناو. بێ گیان ☰ بی‌جان

**نەساخ** / nesax/: ئاوەڵـناو. ١. ☜ **نـەخـۆش** ٢. *[کینایە]* ناڕاسـت؛ دەغـەڵ ☰ ١. ☜ **نـەخـۆش** ٢. حیلەگر

**نەساخن** / nesaxin/: ☜ **نەخۆشی**

**نەساخی** / nesaxî/: ☜ **نەخۆشی**

**نەساز** / nesaz/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **نەخۆش** ٢. ناساز؛ ناتـەبا ٣. چـەق؛ لـە سـەودادا ڕەق ☰ ١. ☜ **نەخۆش** ٢. ناسازگار ٣. سرسخت در مُعامله

**نەساغ** / nesağ/: ئاوەڵـناو. ١. ☜ **نـەخـۆش** ٢. ناڕاست؛ دەغەڵ ☰ ١. ☜ **نەخۆش** ٢. حیلەگر

**نەساغی** / nesağî/: ☜ **نەخۆشی**

**نەساو** / nesaw/: ئاوەڵناو. هەوری؛ بە هەور ☰ ابری

**نەستوری** / nestûrî/: نـاو. لـە ڕێبازەکـانی ئـایینی مەسیحی کە لە کلێسەی ئۆرتودوکس بووەتەوە و شوێنکەوتوانی لە ئێران، عیراق، سووریە و لوبنان، بەتایبـەت دە نێـوان ئاسـوورییەکاندا دەژیـن ☰ نسطوری

**نەستەرەن** / nesteren/: ناو. شـیلان؛ گوڵەشـیلان؛ شیلانەدەشتی؛ ولـەتووتی؛ دلـق؛ دلقـی؛ دلیـق؛ دلێق؛ جلێق؛ جلێق؛ ولەتووت ☰ نسترن

**نەستەعلیق** / neste'lîq/: ناو. لە شێوە نووسینەکانی ئێـرانی کـە لـە سـەدەی نـۆی کۆچیـدا لـە ئاوێتەکردنی دوو خەتی نەسخ و تەعلیق بەدیهات ☰ نستعلیق

**نەستەق** / nesteq/: ئاوەڵـناو. بەڕاسـت و لـە گاڵـتە بەدوور و پەنداوی ‹ئامۆژیارییەکی ورد و نەسـتەق› ☰ جدّی و صریح

▣ **قسەی نەستەق** قسـەی ورد و ڕێـکوپێـک ☰ سُخن نغز

**نەستیل** / nestîl/: ناو. زیان؛ زەرەر ☰ زیان

**نەستێل** / nestêl/: ئاوەڵناو. نالەبار؛ ناجۆر؛ بێ جێگـە ☰ بیجا

**نەستێلە** / nestêle/: ئاوەڵـناو. جـوامێر؛ مێرخـاس؛ مەردوڕەند ☰ رادمرد

**نەسخ** / nesx/: نـاو. شـێوە نووسـینێکی وڵاتـە ئیسلامییەکان، زۆرتر بۆ نووسینەوەی قورئـان ☰ خط نسخ

**نەسرەت** / nesret/: نـاو. ئاریکـاری لـە خـواوە ☰ نُصرت

**نەسرەوت** / nesrewt/: ئاوەڵناو. بزۆز؛ بێ ئارام ‹زامی نەسرەوت› ☰ بی‌آرام

**نەسرین** / nesrîn/: نـاو. گوڵـەچیا؛ گوڵـەبەرامە؛ ولەگولاوی؛ گیایەکی ڕازێنەیی پایای پیوازدارە بە گەڵای درێژی خێڕ- خێڕ و گوڵی بۆنخۆشی زەرد یان سپی هێشوویەوە ☰ نسرین

**نەسل** / nesl/: ناو. ١. پاڵوێنە؛ ڕاوەک ٢. کلافە دەزوو ٣. پشتێن؛ کەمەربەند ٤. نەسڵ؛ تۆرەمە؛ ڕەچەڵەک ☰ ١. پالونە؛ صافی ٢. کلاف نخ ٣. کمربند ٤. نسل؛ نژاد

**نەسڵ** / nesł/: ☜ نەسل ـ٤

**نەسماو** / nes(i)maw/: ☜ نەسواو ـ٢

**نەسواو** / nes(i)waw/: ئاوەڵناو. ١. کولی لە سان نەدراو ٢. نەسماو؛ کوننەکراو ☰ ١. کُند شدەی سوهان نزده ٢. ناسُفته

**نەسۆت** / nesot/: ☜ نەسۆز ـ١

**نەسۆز** / nesoz/: ئاوەڵناو. ١. نەسۆت ٢. خاوەنبەڵێن ☰ ١. نسوز ٢. پایبند به عهد

**نەسو** / nesû/: ئاوەڵناو. قەت تیژ نەبوو (تیخ) ☰ تیز ناشدنی

**نەسەب** / neseb/: ناو. ١. ئامادە بۆ کار تێکردن ٢. نەغمە؛ ڕاڕەو بە ژێر زەمیندا ٣. تۆرەمە؛ ڕەچەڵەک ☰ ١. تأثیرپذیر ٢. نقب؛ تونل زیرزمینی ٣. نسل؛ نژاد

**نەسەق** / neseq/: ناو. مافی کشتوکاڵ لە سەر مەزرای کەسیتر ☰ نَسَق

**نەسەقزل** / neseqzil/: ئاوەڵناو. بادیهەوا؛ خۆبەزلزان ☰ پُرادعا

**نەسەل** / nesel/: ناو. نەسل؛ پاڵوێنە؛ ڕاوەک ☰ صافی

**نەسەلنایە** / neselnaye/: ئاوەڵناو. پاڵێوراو؛ پالافتە ☰ تصفیه شده

**نەسەلناییش** / neselnay(i)ş/: چاوگ. پالاوتن و ساف کردنی تراو ☰ تصفیه کردن

**نەسەلیایش** / neselyayş/: چاوگ. پاڵێوران و ساف بوونی تراو ☰ تصفیه شدن

**نەسەن** / nesen/: ناو. تەرح و بیچم ☰ ریخت و قیافه

**نەسەوە** / nesewe/: ناو. ڕەگەز؛ ڕەگەما؛ بنچینە ☰ نژاد

**نەسیب** / nesîb/: ☜ نسیب

**نەسیحەت** / nesîĥet/: ناو. پەند؛ ئامۆژگاری ☰ اندرز

**نەسیم** / nesîm/: ناو. هۆنە؛ شنە ☰ نسیم

**نەسیو** / nesîw/: ☜ نسیب

**نەشارەزا** / neşareza/: ☜ ناشارەزا

**نەشاسە** / neşase/: ئاوەڵناو. ١. نابەجێ؛ ناڕەوا؛ ناحەق ٢. ناقابیل؛ بێبایەخ ☰ ١. ناروا ٢. بی‌ارزش

**نەشاو** / neşaw/: ناو. ژاراو؛ پاشاو؛ پاشاراو ☰ پساب

**نەشت** / neşt/: ناو. نمتک؛ نز؛ زنە ☰ تراوش

**نەشتەر** / neşter/: ☜ نشتەر

▣ **نەشتەر دان/ کرن**: نەشتەر لێ دان؛ هەڵدڕین بە نەشتەر ☰ جرّاحی کردن

**نەشتەرکار** / neşterkar/: ☜ نەشتەرگەر

**نەشتەرکاری** / neşterkarî/: ☜ نەشتەرگەری

**نەشتەرگەر** / neşterger/: ناو. نژدار؛ نشدار؛ نشتەرکار؛ نیشدار؛ جەڕاح؛ پزیشکی پسپۆڕی نەشتەرگەری ☰ جرّاح

**نەشتەرگەری** / neştergerî/: ناو. نژداری؛ نشتەرکاری؛ نەشتەرکاری؛ لقێ لە زانستی پزیشکی کە دەپەرژێتە سەر بڕین و لابردنی بەشێک لە لەش (وەک: کیسەی زراو؛ ئالوو، ئاپاندیس و ...) یان شانەی شێرپەنجە و دانانی ئامێر و چاک کردنەوەی کەمایەسییەکانی لەش ☰ جرّاحی

**نەشخۆر** / neşxor/: ناو. قەسەڵی بەرماوی ماڵات ☰ پسماندەی علف در آخور

**نەشر** / neşr/: ناو. چاپ و پەخش؛ پیشە و کاری لە چاپ دان و بلاو کردنەوەی کتێب و بلاڤۆک ☰ نشر

**نەشره** / neşre/: ناو. ١. قاغەز و پارچەی باریکی ڕەنگاوڕەنگ کە بۆ جوانی بە دیوارییەوە دەخەن ٢. بلاڤۆک؛ نووسراوەی کۆمەڵێک نووسەر کە

بلاو دەکرێتەوە ﷼ ١. نوار رنگی دکور خانە ٢. نشریە

**نەشس** / neşis/: ناو. نشست؛ نەهامەتی ﷼ بدبیاری

**نەشم** / neşm/: پێرز. ← **کەشمونەشم**

**نەشمیل** / neşmîl/: ئاوەلناو. نەشمیلانە؛ نەشمیلە؛ دەلال؛ جوانی خونچیلانەی دلڕفێن ‹دەیانکرد باوەشێنی، ئەم بەر ـ ئەو بەر/ لە بن سێبەر، کچی نەشمیلی ئەسمەر «هێمن»› ﷼ طنّاز

**نەشمیلانە** / neşmîlane/: ☜ **نەشمیل**

**نەشمیلە** / neşmîle/: ☜ **نەشمیل**

**نەشناس** / neşnas/: ☜ **نەناس**

**نەشود** / neşud/: ئاوەلناو. نەکراو؛ نەکردنی؛ ناکردنی ﷼ نشدنی

**نەشۆر** / neşor/: ئاوەلناو. زاوەرساو؛ زاوەرسە؛ لە زگ وەستاو ﷼ یائسە

**نەشە**[1] / neşe/: ناو. ١. کەیف؛ شادی ‹نەشەی نەماوە› ٢. سەرەتای مەست بوون ﷼ ١. نشاط ٢. نشئە

**نەشە**[2]: ئاوەلناو. سەرخۆش؛ کەیفساز ﷼ سرخوش

▣ **نەشە بوون**: ١. کەوتنە سەر شەوق و شادی ٢. مەست بوون ﷼ ١. بانشاط بودن ٢. مست شدن

**نەشە گرتن**: کەیف ساز بوون ﷼ سر نشاط آمدن

**نەشەهرەزا** / neşehreza/: ☜ **ناشارەزا**

**نەشیاو** / neş(i)yaw/: ناو. ناهێژا؛ ناحەز؛ ناپەسند؛ گەن؛ نابەدڵ ﷼ نامطلوب

**نەشید** / neşîd/: ناو. سروود ﷼ سرود

**نەشیرین** / neşîrîn/: ☜ **ناشیرین**

**نەع** / ne'/: ناو. نە؛ نەء ﷼ نە

**نەعتک** / ne'tik/: ناو. نەهتک؛ ئەنی؛ تویڵ؛ ناوچاوان ﷼ پیشانی

**نەعرە** / ne're/: ☜ **نەعرەتە**

**نەعرەتە** / ne'rete/: ناو. نەعرە؛ نارەتە؛ گوڕڕە؛ نەڕڕە ﷼ نعرە

**نەعل** / ne'l/: ناو. ١. ناڵ ٢. سۆل؛ پێلاوی سفک کە بە سەر پێوە دەکرێ ﷼ ١. نعل ٢. دمپایی

**نەعلەت** / ne'let/: ناو. نالەت؛ نەحلەت؛ لەعنەت ﷼ لعنت

**نەعنا** / ne'na/: ناو. ناعنا؛ ناعنە؛ نەعنە؛ نەناباخی؛ هێزا؛ بوودینە؛ گیایەکی گەلاوردی تامتیژی بۆنخۆشە، وشک دەکرێ و بۆ تام و بۆ لە چێشتی دەکەن ﷼ نعناع

**نەعناکێویلکە** / ne'nakêwîlke/: ☜ **نەعناکێویلە**

**نەعناکێویلە** / ne'nakêwîle/: ناو. نەعناکێویلکە؛ نەعنەکێویلە؛ جاترە؛ پوونگەکێویلە؛ پوونگەڕێوی؛ تهتاوک؛ تهتاڤک؛ تەهتاڤک؛ تەتاڤک؛ ڕووەکێکی کێوی و خۆڕسکە، گەڵاکانی بۆنی نەعنا ئەدەن ﷼ نعناع کوهی

**نەعنە** / ne'ne/: ☜ **نەعنا**

**نەعنەکێویلە** / ne'nekêwîle/: ☜ **نەعناکێویلە**

**نەعوزوبیللا** / ne'ûzubîlla/: سارستە. پەنا بە خوا ﷼ نعوذباالله

**نەغد**[1] / neğd/: ناو. نەخت؛ پووڵ؛ پارەی لە بەردەست بۆ خەرج کردن ﷼ نقد؛ مُقابل جنس

**نەغد**[2]: ئاوەلناو. نەخت؛ وشک؛ ئامادەی دانوسان؛ پێچەوانەی قەرز ‹پارەی نەغد› ﷼ نقد؛ مُقابل قرض

**نەغد**[3]: ئاوەلکار. نەخت: ١. دەسبەنەخت؛ بە شێوەی ئامادەی دان و وەرگرتن ‹پارەکەی نەغد دەدەم› ٢. بە شێوەی دەسبەجێ و بێ قەرزوقۆڵە ‹نەغد مامەڵە دەکەم› ٣. پوولی؛ دراوی؛ بە پارەی باوی وڵات ‹چەک دەدەی یا نەغد دەیسێنی؟› ﷼ ١تا٣. نقدی

**نەغدبەنەغد** / neğdbeneğd/: ئاوەلکار. دەسبەدەس؛ دەستبەدەست ﷼ نقداً

**نەغدوپوخت** / neğd û puxt/: ☜ **نەختوپوخت**

**نەغدی** / neğdî/: ئاوەلناو. دەستی؛ نەختی ﷼ نقدی

**نەغدینە** / neğdîne/: ☜ **نەختینە**

**نەغم** / neğm/: ناو. ١. ☜ **نەغمە** ٢. کاری قۆچ وەشاندنی کەڵ لە بەر خۆوە ☰ ١. ☜ **نەغمە** ٢. عمل حمله بردن خودبخودی قوچ

**نەغمە** / neğme/: ناو. نەغم: ١. هەوای گۆرانی ‹نیونیگای خەندەی ئەستێرەی ئەمەل/ نەغمەی گفتوگۆی وەک جریوەی مەل «گۆران»› ٢. ڕەهەند؛ ڕێگە بەژێر زەویدا ‹لە ژوورەکەیانەوە نەغمەیەکیان لێ داوە و هەڵاتوون!› ٣. کاری سەر وەشاندنی بەران ‹بەرانەکە نەغمەیەکی لێ دام، خەریک بوو ملم بشکێ!› ☰ ١. نغمه؛ آواز ٢. نقب؛ راه زیرزمینی ٣. عمل کله زدن قوچ

**نەف** / nef/: ☜ **نەفع**

**نەفاچڵ** / nefaçił/: ئاوەڵناو. نەگونجاو؛ ئاکارناشیرین ☰ بدکردار

**نەفام** / nefam/: ئاوەڵناو. نافام؛ بێئاوەز ☰ نفهم

**نەفامی** / nefamî/: ناو. نافامی؛ بێئاوەزی ☰ نفهمی

**نەفت** / neft/: ☜ **نەوت**

**نەفتالین** / neftalîn/: ناو. بلۆرێکی سپی بۆن‌تیژە لە بەرێکەوە گازی ژەهراوی لێدەبێتەوە و دژی مێروو بەتایبەت مۆردە و لە پیشەسازیشدا بە کار دێ ☰ نفتالین

**نەفتاوی** / neftawî/: ☜ **نەوتاوی**

**نەفتخانە** / neftxane/: ☜ **نەوتخانە**

**نەفتفرۆش** / neftf(i)roş/: ☜ **نەوتی**[1]**ـ٢**

**نەفداندن** / nefdandin/: چاوگ. ڕزگار کردن ☰ نجات دادن

**نەفدین** / nefdîn/: چاوگ. ڕزگار بوون ☰ نجات یافتن

**نەفر** / nefr/: ناو. ١. شاخی مالات ٢. هەرچی وەک شاخ قیت بێت ☰ ١. شاخ حیوانات ٢. هر چیز برجسته مانند شاخ

**نەفرە**[1] / nefre/: ☜ **نفرین**

**نەفرە**[2]: ☜ **نەفری**

**نەفری** / nefrî/: ئاوەڵناو. نەفرە؛ دەرکراو ☰ رانده‌شده

**نەفرین** / nefrîn/: ☜ **نفرین**

**نەفس** / nefs/: ناو. ١. گیاندار؛ گیانلەبەر ٢. نەوس؛ دڵ و دەروون ‹نەفسم بۆ گۆشت دەچێ› ☰ ١. جاندار ٢. نفس

**نەفس‌پیس** / nefspîs/: ئاوەڵناو. بەرچاوتەنگ؛ چاوچنۆک ☰ حسود

**نەفس‌پێت** / nefspêt/: ئاوەڵناو. ١. هێمن؛ بەبڕست؛ بین‌فرەه ٢. زاڵ بە سەر ئارەزوودا ☰ ١. شکیبا ٢. مُسلّط بر نفس

**نەفسکوێر** / nefsk(i)wêr/: ئاوەڵناو. زاڵ بە سەر نەفسدا بەتایبەت لە بواری خواردندا ☰ مُسلّط بر خود (در خورد و خوراک)

**نەفس‌نزم** / nefsnizm/: ئاوەڵناو. خوێڕی؛ بە کەسایەتی سووک و نزم ☰ بی‌شخصیت

**نەفسەک** / nefsek/: ئاوەڵناو. نەوسن؛ چڵێس ☰ شکم‌پرست

**نەفع** / nef'/: ناو. نەف؛ قازانج؛ فێدە؛ بەهرە ‹کە نەفعێکت نەبوو بۆ دین و دەوڵەت/ بە من چی نەقشبەندی یا نە مانی؟ «حاجی قادر»› ☰ نفع

**نەفوورات** / nefûrat/: ☜ **نفورات**

**نەفەر** / nefer/: ناو. ١. تاکەکەس ٢. یەکەی ژماردن ☰ ١و٢. نفر

**نەفەرات** / neferat/: ناو. کەسان؛ چەند کەس ☰ نفرات

**نەفەرما** / neferma/: ناو. جگە لە هێزی چەکدار؛ مرۆی دوور لە سەربازی بەڵام چەک بەدەس ☰ بسیجی

**نەفەس** / nefes/: ناو. نەفەسە؛ هەناسە؛ بایەک کە لە ناو دەم و سیپەلاکدا دێ و دەچێ ‹تەن مەعسیەتبار، دەروون پڕ جە دەرد/ دیدە تەڕ، لەب

وشک، دڵ گەرم، نەفەس سەرد! «مەولەوی» ≡ نفس؛ دم

⊡ **نەفەس دان**: نەفەس کێشان: ١. هەناسە دان ٢. *[کینایە]* زیندوو بوون ≡ ١. نفس کشیدن ٢. زنده بودن

**نەفەس دەرنەهاتن**: ☜ نەفەس نەدان

**نەفەس نەدان**: *[کینایە]* نەفەس دەرنەهاتن؛ قسە نەکردن؛ هیچ نەگوتن ≡ لام تا کام حرف نزدن

**نەفەس‌پیس / nefespîs/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* چاوپیس؛ شووم ≡ شوم

**نەفەس‌درێژ / nefesdirêj/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* بەپشوو؛ لەسەرخۆ ≡ آرام؛ شکیبا

**نەفەسە / nefese/**: ☜ نەفەس

**نەفەق / nefeq/**: ناو. تونێل ≡ تونل

**نەفەقە / nefeqe/**: ناو. ١. خەرجی؛ بژیو؛ خەرجی ڕۆژانە ٢. بژیوی پێویست بۆ ژیانی ژن و منداڵ ≡ ١. هزینەی زندگی ٢. نفقه؛ هزینەی افراد خانواده

**نەفەل / nefel/**: ناو. ١. گیایەکی بۆنخۆشە ٢. لەوەڕی تەڕ؛ سێوەڕە ≡ ١. گیاهی خوشبو ٢. علف سبز

**نەڤا / neva/**: ناو. هەوای گۆرانی؛ ڕەوتی ستران ‹نەڤایا موتریب و چەنگێ، فەغان ئاڤێتە خەرچەنگێ/ وەرە ساقی حەتا کەنگێ، نەشۆیین دل ژ ڤێ ژەنگێ؟ «مەلای جزیری»› ≡ نوا

**نەڤازە / nevaze/**: ئاوەڵکار. زیاد لە پێویست ≡ بیش از حدّ لازم

**نەڤاندن / nevandin/**: چاوگ. بژارتن؛ بژاردن ≡ شُمُردن

**نەڤرۆز / nevroz/**: ☜ نەورۆز

**نەڤس / nevs/**: ناو. زڕ: ١. زڕکوڕ ٢. زڕکچ ≡ ١. ناپسری ٢. نادختری

**نەڤسی / nevsî/**: ناو. زڕکوڕ ≡ ناپسری

**نەڤش / nevş/**: ناو. ١. بنەوشە؛ گوڵ وەنەوشە ٢. مۆر؛ ڕەنگی بنەوش ≡ ١. بنفشه ٢. رنگ بنفش

**نەڤی**[١] **/ nevî/**: ناو. نەوە؛ فرزەندی فرزەند ≡ نوه

**نەڤی**[٢]: ☜ نەوی

**نەڤیان / nevyan/**: چاوگ. ناخۆش ویستن؛ خۆش گەرەک نەبوون ≡ دوست نداشتن

**نەڤیچرک / nevîçirk/**: ☜ نەڤیچی

**نەڤیچڕ / nevîçiř/**: ☜ نەڤیچی ـ١

**نەڤیچی / nevîçî/**: ناو. نەڤیچرک: ١. نەڤیچڕ؛ نەتیجە؛ منداڵی نەوە ٢. نەبیرە؛ نەوەی نەوە ≡ ١. نتیجه؛ فرزند نوه ٢. نبیره؛ نوەی نوه

**ـ نەڤیس / nevîs/**: پاشەوشە. ـ نووس؛ ـ نووس؛ کاری نووسین ≡ ـ نویس

**نەڤیساندن / nevîsandin/**: چاوگ. نڤیساندن؛ نووسین ≡ نوشتن

**نەڤینا / nevîna/**: ئاوەڵناو. وازوازی؛ بە خۆ نەوەستاو ≡ بی‌اراده

**نەق**[١] **/ neq/**: ناو. چۆنیەتی پەڕینی پەلکی چاو ≡ پرش پلک چشم

**نەق**[٢]: ئاوەڵناو. بژاردە؛ هەڵبژاردە ≡ مُنتخب

**نەق**[٣]: دەنگەناو. نق؛ خوست ≡ جیک؛ کمترین صدا

**نەقار / neqar/**: ناو. بەردتاش ≡ سنگتراش

**نەقارە / neqare/**: ناو. نقارە؛ سازێکی زەربی بە دوو دەهۆڵی گەورە و پچووکەوە کە بە یەک کەس دەژەنرێ ‹گرمەی نەقارە و لرفەی شەرواڵان/ زرەی پاموورە و زرنگەی خرخاڵان «مەولەوی»› ≡ نقّاره

**نەقارەخانە / neqarexane/**: ناو. جێگەی دۆڵ و نەقارە لێدان ≡ نقارەخانه

**نەقازە / neqaze/**: ناو. بەڵا؛ چۆرتم ≡ بلا

**نەقاڵ / neqał/**: ئاوەڵناو. نەققاڵ؛ قسەخۆش ≡ خوش‌گفتار

**نەقام / neqam/**: ناو. ١. قام؛ مقام؛ نقام؛ گۆرانی ٢. هەوای گۆرانی ≡ ١. ترانه ٢. آهنگ

**نەقان / neqan/**: چاوگ. ١. بژاردن؛ هەڵبژاردن ٢. نقان؛ نقاندن؛ زۆر بۆ خۆ هێنان ☰ ١. انتخاب کردن ٢. زخیدن؛ زور زدن

**نەقاندن / neqandin/**: چاوگ. نقاندن: ١. بژارتن ٢. نقه کردن ☰ ١. انتخاب کردن ٢. زخیدن؛ زور زدن

**نەقاندنی / neqand(i)nî/**: ئاوەڵناو. بژاردە؛ هەڵبژاردە ☰ گُزیده؛ مُنتخب

**نەقاندی / neqandî/**: ئاوەڵناو. بژاردە؛ هەڵبژاردە ☰ مُنتخب

**نەقتاندن / neqtandin/**: چاوگ. ئارەقە کردن؛ خوە دان ☰ عرق کردن

**نەقر / neqr/**: ئاوەڵناو. ١. قووڵ؛ کووڕ؛ قوویل (چاڵ) ٢. قووڵ و هەراو (دەفر) ☰ ١. عمیق (چاه) ٢. گود و گشاد (ظرف)

**نەقرا / neqra/**: ناو. دەهۆڵ؛ دەوڵ؛ دۆڵ ☰ دُهُل

**نەقرنەپڕ / neqiřnepiř/**: ئاوەڵناو. بژی(و)مەمر؛ نەمرنەژی؛ باری ژیانی زۆر ساکار و هەژارانە ‹ژیانی نەقرنەپڕ› ☰ بخور و نمیر

**نەقش / neqş/**: ☜ نەخش

**نەقشاندن / neqşandin/**: ☜ نەخشاندن

**نەقشبەند / neqşbend/**: ☜ نەخشبەند

**نەقشبەندی / neqşbendî/**: ☜ نەخشبەندی

**نەقشبەندییە / neqşben(i)dîye/**: ☜ نەخشبەندییە

**نەقشدار / neqşdar/**: ☜ نەخشدار

**نەقش‌ونیگار / neqş û nîgar/**: ☜ نەخش‌ونیگار

**نەقشە / neqşe/**: ☜ نەخشە

**نەققاش / neqqaş/**: ناو. نەقاش: ١. نیگارڤان؛ شێوەکار؛ وێنەکێش؛ وێنەکر؛ شێوەکێش؛ نیگارکێش؛ کێشانکار؛ ڕەسمچی ٢. ڕەنگ‌کار؛ بۆیەچی؛ ئەو کەسە دەر و دیواری ماڵ ڕەنگ دەکا ٣. کەسێ کە ڕووبەری ماشین، پاش سافکاری ڕەنگ دەکا ☰ ١تا٣. نقّاش

**نەققاشی / neqqaşî/**: ناو. نەقاشی: ١. شێوە؛ نیگار؛ وێنە؛ هەرچی بە دەست کێشراوە ٢. نیگارکێشی؛ نگارین؛ شێوەکاری؛ وێنەسازی؛ هونەری نواندن و هێنانە بەر چاوی شتێک لە سەر پەڕەیەک بە قەڵەم و ڕەنگ ٣. ڕەنگ‌کاری؛ کاری داپۆشانی ڕووبەرێک بە توێژی ڕەنگ ☰ ١تا٣. نقّاشی

**نەققاڵ / neqqał/**: ☜ نەقاڵ

**نەققە / neqqe/**: ☜ نقە

**نەقل / neql/**: ناو. بەرۆشی مەزن؛ مەنجەڵی گەورە ☰ دیگ بزرگ

**نەقلەک / neqlek/**: ئاوەڵکار. کەڕەتێ؛ دەحفەیەک؛ جارێک لە جاران ☰ یک بار

**نەقڵ / neqł/**: ناو. ١. کاری گوێزانەوە ٢. بەسەرهات؛ سەرگوروشتە ‹نەقڵی خۆمت بۆ بڵێم› ٣. چیرۆک؛ نەزیرە؛ نەزیلە؛ حەکایەت ‹یەقین بیستووتە و دڵت نائێشێ/ نەقڵی قشقەڕە و پشتی گامێشێ «حەقیقی»› ☰ ١. انتقال ٢. سرگذشته ٣. داستان کوتاه

**نەقور / nequr/**: ☜ نکل

**نەقوس / nequs/**: ☜ نوقورچك

**نەقوستان / nequstan/**: ☜ نوقسان

**نەقوسکی / nequskî/**: ☜ نوقورچك

**نەقوسکێ / nequskê/**: ناو. کورینگان؛ نقورچک؛ کوڕنیشک؛ قورنج ☰ نیشگون

**نەقە / neqe/**: ☜ نقە[1]

**نەقەب / neqeb/**: ناو. ١. شیوەڵە؛ دەڕەی تەنگەبەر ٢. نەغمە؛ ڕێگە بە ژێر زەویدا ☰ ١. درّەی تنگ ٢. نقب؛ راه زیرزمینی

**نەقەنۆ / neqeno/**: ئاوەڵناو. بێفەڕ؛ بەدفەڕ؛ شەڕانی ☰ ستیزەجو

**نەقی / neqî/**: ناو. نەقینە؛ ناهەقی؛ زوڵم؛ دەسدرێژی ☰ ظلم؛ تعدی

**نەقیان** / neqyan/: ☜ **نەقین**

**نـەقیزە** / neqîze/: نـاو. ١. داریَ کــە نــووکێکی ئاسـنی تیـژی دە سـەرگیراوە گـا و کـەری پـێ لێدەخوڕن ٢. هەر جۆرە شتی تیژ و نووسکن کە بۆ ئەو کارە بشێ ‹زانا وە ئیشـارە، نـەزان وە نـەقیزە «قسەی نەستەق»› ≡ ١. غاوشنگ ٢. سیخونک

▣ **نەقیزە دان**: تێوەژاندن؛ تێوەژەنـدن ١. نـەقیزە لە حـەیوان دان بـۆ ئـاژۆتن ٢. /کینایە/ بـە زۆر کاریَ پێ کردن ‹هەر بە نەقیزە دان ئەیخوێنـد و دلّی بە لای دەرسەکەیەوە نەبوو!› ≡ ١. سیخونک زدن ٢. به زور به کاری وادشتن

**نەقین** / neqîn/: چاوگ. نەقیان؛ فڕینی چاو؛ چـاو فریان؛ پەڕینی پێڵووی چاو ≡ پریدن پلک چشم

**نەقینە** / neqîne/: ☜ **نەقی**

**نەقیە** / neqye/: ناو. نەقی؛ ناهەقی ≡ ظلم

**نەک**[1] / nek/: ئامراز. نەکوو؛ نەکوونێ؛ نـەوەکوونێ؛ نەگ؛ نە تەنیا؛ نە هـەر ‹نـەک گولـێک و سـیان و چوار/ چەن لە دێدا هەبێ نـازدار! «گـۆران»› ≡ نـه فقط

**نەک**[2]: نـزا. نــەکوو؛ نــەکا؛ نــەگ؛ مــەبادا؛ نــەبادا ‹چاوەکەم ئەمڕۆ لە گولشەن گوڵ بە عیشـوە خـوەی نواند/ نەک نمەک‌گیر بم، بە گیانی تۆ قەسـەم هـیچ نەمدواند «حەریق»› ≡ مبادا

**نەکا** / neka/: نزا. نەک؛ نەکا؛ نەوەک ‹مـەچۆ لێـو کەلکەکە نەکا داکەوی› ≡ نکند؛ مبادا

**نـەکاڵ** / nekał/: ئاوەڵـناو. نەکــەر؛ شــێونەبڕاو ≡ شخم‌نزده

**نەکاو** / nekaw/: ☜ **ناکاو**

**نەکای**[1] / nekay/: ☜ **نوها**

**نەکای**[2]: ئاوەڵکار. تا ئێستەش ≡ هنوز هم

**نەکرانـدن** / nekrandin/: چــاوگ. خوێنــــدنی باڵندەی شەوگەڕ ≡ خواندن پرندەی شبگرد

**نـەکراو** / nekiraw/: ئاوەڵـناو. نـەکردە؛ نـەکردوو؛ نەکریاگ؛ ئەنجام‌نەدراو؛ پێچەوانەی کراو ‹مـاچی نەکراو و زەنگی زڕاو! «مەسەل»› ≡ ناکرده؛ نکرده

**نەکردنی** / nekird(i)nî/: ئاوەڵـناو. نەکراو؛ نـەبووگ ≡ ناشُدنی

**نەکردوو** / nekirdû/: ☜ **نەکراو**

**نەکردە** / nekirde/: ☜ **نەکراو**

**نەکریاگ** / nekiryag/: ☜ **نەکراو**

**نەکس** / neks/: ناو. ١. نەخۆشی سەرما بـوون کـە سیپەلاک دێشێ ٢. شەگگە؛ باری مـیری قـاپ؛ تەنیشتی قوولـی مـیچ ≡ ١. بیمـاری ذات‌الریـه ٢. طرف گود شتالنگ

**نەکسۆ** / nekso/: نـاو. نەخۆشـی سـەرما بـوون ≡ سرماخوردگی

**نەکقارسا** / nekqarsa/: ☜ **نەکقیچ**

**نەکقارسە** / nekqarse/: ☜ **نەکقیچ**

**نەکقووچکن** / nekqûçkin/: ☜ **نەکقیچ**

**نـەکقیچ** / nekqîç/: ئاوەڵـناو. نــەکقــووچکن؛ نـەکقـیچن؛ نەکقارسـا؛ نەکقارسـە؛ ددان‌گـڕ و دەرپــەڕیوی ددان لــە بــەر چــاوان دیــار ≡ دندان‌برجسته

**نەکقیچن** / nekqîçin/: ☜ **نەکقیچ**

**نەکلمانـدن** / nekilmandin/: چـاوگ. بەســـتن؛ داخستن؛ پێوەدان ≡ بستن

**نـەکلۆک** / nek(i)łok/: ئاوەڵـناو. ناکلـۆک؛ نـەکوڵ؛ نەکولۆک: ١. بیژۆک؛ بەبێ خێرایی پێویست بـۆ کـولان ٢. /مەجاز/ ناسـازگار و سـارد و سـڕ ‹بـۆ ئەوەندە نەکلۆک و ناتەبان؟› ≡ ١. دیرپز ٢. ناسـازگار و دیرجوش

**نەکنەکیل** / neknekîl/: ☜ **نکلونکین**

**نەکوتە** / nekute/: ☜ **نەگوتە**

**نەکوچ** / nekuç/: دەنگەناو. قرووسکە؛ ناڵەی سەگ ≡ زوزەی سگ

**نەکوچانـدان** / nekuçandin/: چـاوگ. قرووســـکە

کردن؛ ناڵاندنی سەگ 🇮🇷 زوزه کردن سگ

**نەکوڵ** / nekuł/: ☜ **نەکڵۆك**

**نەکوڵاو** / nekuław/: ئاوەڵناو. کاڵ؛ خاو 🇮🇷 ناپُخته

**نەکوڵاوی** / nekuławî/: ناو. خاوی 🇮🇷 ناپُختگی

**نەکوڵۆک** / nekułok/: ☜ **نەکڵۆك**

**نەکوو** / nekû/: ☜ **نەك**

**نەکوونێ** / nekûně/: ☜ **نەك**[1]

**نەکەر** / neker/: ☜ **نەکاڵ**

**نەکەرۆز** / nekeroz/: ئاوەڵناو. زۆر سارد 🇮🇷 بسیار سرد

**نەکەس** / nekes/: ئاوەڵناو. ١. ناڕەسەن؛ نانەجیب ٢. ڕژد و چرووک ٣. ☜ **ناکەس** 🇮🇷 ١. بداصل ٢. خسیس ٣. ☜ **ناکەس**

**نەکەونەدازگیر** / neke w nedajgîr/: ناو. ئامرازێکی دەخڵ بێژانە لە کەو تەنگتر لە داژگیر هەراوتر 🇮🇷 نوعی غربال سوراخ‌گشاد

**نەکەه** / nekeh/: ☜ **نیکاح**

**نەکی** / nekî/: نزا. نەبادا؛ مەبادا؛ نەک 🇮🇷 مبادا

**نەکێڵ** / neкěł/: ئاوەڵناو. تایبەتمەندی زەوینێ کە بۆ کێڵان نابێ 🇮🇷 غیرقابل کشت

**نەکێڵدراو** / nekěłd(i)raw/: ☜ **نەئازۆتی**

**نەکێڵراو** / nekěłraw/: ئاوەڵناو. مەکاڵ؛ مەکار؛ بەیار 🇮🇷 بایر

**نەگ**[1] / neg/: ناو. نەق؛ ڕەوتی پەڕینی پێڵووی چاو 🇮🇷 پرش پلک چشم

**نەگ**[2]: ☜ **نەك**

**نەگاندن** / negandin/: چاوگ. نەقاندن؛ فڕینی چاو؛ پەڕینی پێڵووی چاو 🇮🇷 پریدن پلک چشم

**نەگبەت**[1] / negbet/: ناو. نەدامەت؛ بەڵا؛ چۆرتم ‹چارەڕەشی و نەگبەت لەو دیمەنە دەباری «هێمن»› 🇮🇷 مُصیبت

**نەگبەت**[2]: ئاوەڵناو. نەدامەت؛ بەدبەخت؛ چارەڕەش ‹شەیتانە کوێرە نەگبەتەکەیش خۆ بە بێوچان/ چیم بۆ خەرابە، ئەومە ئەکات هەر بە ڕیشەوە!› «شاهۆ بیارەیی» 🇮🇷 سیەروز

**نەگبەتی** / negbetî/: ناو. بەدبەختی ‹کەسێ نەگبەتی بێتە سەر شانی/ پەلۆلە بخوا دەشکێ ددانی! «مەلا غەفوور»› 🇮🇷 سیەروزی

**نەگریا** / negirya/: ئاوەڵناو. نەکوڵاو؛ کاڵ؛ نەپوختە 🇮🇷 ناپخته؛ خام

**نەگریس** / negrîs/: ئاوەڵناو. لاسار؛ سەرشەق؛ گوێنەبیس و بەدفەڕ ‹ژن لە لای مێردی خۆشەویس ئەکەم/ یا بە نووشتەی ڕەش نەگریسی ئەکەم «قانع»›. هەروەها: **نەگریسی** 🇮🇷 لجباز و بدرفتار

**نەگوتە**[1] / negute/: ئاوەڵناو. نەکوتە؛ نەگوتراو؛ نەوێژیاگ؛ نەگۆتی ‹حیکایەتی نەگوتە› 🇮🇷 ناگفته

**نەگوتە**[2]: ئاوەڵکار. نەکوتە؛ نەگوتراو؛ نەوێژیاگ؛ نەگۆتی؛ بەبێ گوتن ‹نەگوتە لێم تێگەیشت!› 🇮🇷 ناگفته

**نەگونجاو** / neguncaw/: ئاوەڵناو. نابەجێ؛ ناهەنجار 🇮🇷 ناهنجار

**نەگونجاوی** / neguncawî/: ناو. بارچەوتی؛ ناڕاستی 🇮🇷 کجروی

**نەگوهێر** / neguhêř/: ☜ **نەگۆڕ**

**نەگۆتی** / negotî/: ☜ **نەگوتە**

**نەگۆڕ** / negoř/: ئاوەڵناو. نەگوهێر؛ بێگۆڕان ‹بنەمای نەگۆڕ؛ یاسای نەگۆڕ› 🇮🇷 تغییرناپذیر

**نەگۆمە** / negome/: ئاوەڵناو. ١. نەبەگە؛ خۆنەگرتوو ‹دوای ئەو شەپلەی لێی دا، ئێستا دەست و قاچی نەگۆمەیە› ٢. *[مەجاز]* سست و سەپۆل 🇮🇷 ١. سست و کم‌حرکت ٢. دست‌وپاچلفتی

**نەگە** / nege/: ناو. بوختان؛ هەڵبەست؛ تۆمەت 🇮🇷 بُهتان

**نەگەنمنەجۆ** / ne genim ne co/: ناو. دەغڵێکە، بە ڕەنگ گەنم و بە بیچم جۆیە و دەکرێتە نان 🇮🇷 از

غلات

**نەگـەویس** / negewîs/: ئاوەڵـناو. نەنگەویسـت؛ نـەویس؛ نەویسـت؛ خـوێنتـاڵ لـە بـەر چـاوی هەمووانەوە 🇮🇷 منفور

**نەگـەیشـتو** / negeyiştû/: ئاوەڵـناو. نەگـەیو؛ نەڕەسیو؛ کاڵ 🇮🇷 کال؛ نارسیده

**نەگەیو** / negeyiw/: ☜ نەگەیشتو

**نەگها** / neg(i)ha/: ☜ نەگهیشتی

**نەگهیشـتی** / neg(i)hîştî/: ئاوەڵـناو. نـەگها: ١. نەگەیشتوو؛ کاڵ ٢. نابالغ؛ شـەیتانی نـەبووگ 🇮🇷 ١. کال ٢. نابالغ

**نـەگیراو** / negîraw/: ئاوەڵـناو. نـەگیریاگ: ١. وەرنەگیراو ٢. دەستەمۆ نەکراو؛ بـەر بـار و زیـن نـەخراو (یەکسـمی تـۆڕی) 🇮🇷 ١. گرفتـەنشـده ٢. رام‌نشده

**نەگیریاگ** / negîryag/: ☜ نەگیراو

**نەلامەت** / nelamet/: ئاوەڵناو. بێفەڕ؛ نەحلـەتی 🇮🇷 لعنتی

**نەلەڤهاتی** / nelevhatî/: ئاوەڵناو. ١. پێکنـەهاتوو ٢. نەشیاو بـۆ یـەکتر 🇮🇷 ١. بـە توافـق نرسـیده ٢. نامُناسب برای هم

**نەلێ** / nelê/: ئاوەڵناو. ڕەگەڵ نەخراو؛ وەرنـەگیراو لە کۆمەڵی زەماوەن و کێبەرکێدا 🇮🇷 قبـول نشـده در گروه

**نەلێیە** / nelêye/: ئاوەڵـناو. بە هیچ حەساو نـەکراو 🇮🇷 بی‌اعتبار

**نەلاتە** / nełate/: ☜ نەڕە

**نەم** / nem/: ناو. شە؛ شێ؛ نم 🇮🇷 نم

**نـەماج** / nemac/: نـاو. ١. ☜ نـــویژ ٢. ☜ نەماجی

**نـەماجی** / nemacî/: نـاو. نـــەماج؛ نـــەماژی؛ بەرەبەیان؛ کاتی نـوێژی بـەیانی 🇮🇷 صبح؛ پگـاه؛ هنگام نماز صبح

**نەمازە** / nemaze/: ☜ نەخوازە

**نەماژ** / nemaj/: ناو. ١. ☜ نـویژ ٢. بەرەبـەیانی 🇮🇷 ١. ☜ نویژ ٢. بامدادان

**نەماژی** / nemajî/: ☜ نەماجی

**نەمام**[1] / nemam/: ناو. ١. چلە ڕیشـەی یەکسالەی دار ‹زۆری نەماوە بێتە بەر نەمامی هـەوڵ و خـەباتم/ لـە داگیرکـەر پـاک بێتـەوە خـاکی پـیرۆزی وڵاتم «هێمن»› ٢. نۆنەمام؛ نەونەمام؛ منداڵی شەش تـا دوازدە ساڵان ‹نەمام بـووم زریـان نەیچەماندمـەوە/ خوایە بە پـیری نەچەمێمـەوە! «پەشـێو»› ٣. قاڵـی لاکێش ٤. شۆڤار؛ دووزمان 🇮🇷 ١. نهـال ٢. نونهـال ٣. نوعی قالی مرغوب ۴. جاسوس

⊡ **نەمام کردن:** *[کنایە]* کەسێ دە نـاو لای دیـوار خستن و کوشتنی ‹خان کاورایەکی نەمام کـرد› 🇮🇷 لای دیوار گذاشتن محکوم

**نەماندن** / nemandin/: چـاوگ. خووسـاندن؛ بـە تەوش نەرم کردن 🇮🇷 خیساندن

**نەمدان** / nemdan/: ناو. دەفـرێ کـە شـتی تێـدا دەخووسـێنن 🇮🇷 ظرفـی کـه چیـزی را در آن می‌خیسانند

**نەمر** / nemir/: ئاوەڵناو. ١. هەتاهـەتایی؛ دوور لـە مردن ‹بەو خودایە کە نەمرە ...› ٢. خاوەنی ژیـان و کاری شایانی وا کـە دوای مـردنیش لـە بـیر و دڵدا ماوەتەوە ‹شێخ مەحموودی نەمر› 🇮🇷 ١. جاوید ٢. زنده‌یاد

⊡ **بە نەمر دان:** قەرز دانی مریشـک و ئـاژەڵ بـە مـەرجێ بـە زینـدوویی پـێ بدرێتـەوە ‹ئـەو مانگایەت بە نەمر دەدەمێ› 🇮🇷 قرض دادن حیوان به شرطی که زنده برگردانند

**نـەمر** / nemr/: ئاوەڵناو. ١. ☜ نـەرم[1] ٢. پشـوو لەسەرخۆ؛ هێدی 🇮🇷 ١. ☜ نەرم[1] ٢. آرام

**نەمرچ** / nemirç/: ئاوەڵناو. مرومۆچ؛ نێوچاوان‌گـرژ؛ ناوچاوتاڵ؛ ڕووناخۆش 🇮🇷 اخمو

**نەمرنەژی** / nemirnejî/: ☜ **نەمرونەژی**

**نەمر . نەمر** / nemr nemr/: ئاوەڵکار. نەرمە ـ نەرمە؛ هێدیکا ـ هێدیکا ☲ آرام ـ آرام

**نەمرونەژی**[1] / nemir û nejî/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* مەمرە و مەژی؛ نەمرنەژی؛ خراپ و نالەبار ‹ژیانی نەمرونەژی› ☲ بخور و نمیر

**نەمرونەژی**[2]: ئاوەڵکار. نەمرنەژی؛ بە نەخۆشی و لە نێوان مان و ژیاندا ‹نەمرونەژی دەیگوزەرێنێ› ☲ با حال وخیم

**نەمرۆ** / nem(i)ro/: ☜ **ناپیاو**

**نەمرۆڤ** / nem(i)rov/: ☜ **ناپیاو**

**نەمرەیی** / nemreyî/: ناو. ١. سروە؛ شنەبا؛ نەرمەبا؛ کزەبا ٢. نەرمایی؛ دژی ڕەقی ☲ ١. نسیم ٢. نرمی

**نەمری** / nemirî/: ناو. هەربوونی ☲ جاودانگی

**نەمڵچ** / nemiłç/: ئاوەڵناو. تەواو بێدەنگ و بێ‌هەست ☲ ساکت و بی‌صدا

**نەموچ** / nemuç/: ☜ **نموونە**

**نەموش** / nemuş/: ☜ **نموونە**

**نەمووش** / nemûş/: ناو. نموونە؛ نمانا ☲ نمونە

**نەمە** / neme/: ☜ **نەوی**

**نەمەرد** / nemerd/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **ناپیاو** ٢. *[مەجاز]* ترسەنۆک ☲ ١. ☜ **ناپیاو** ٢. بُزدل

**نەمەس** / nemes/: ناو. کرێژی سەر ☲ شورەی سر

**نەمەک** / nemek/: ناو. نامە؛ ١. قاغەزی نووسراو کە ڕەوانە دەکرێ ٢. ☜ **خوێ ـ١** ☲ ١. نامە ٢. ☜ **خوێ ـ١**

**نەمیانەوە** / nemyanewe/: چاوگ. داهاتنەوە؛ چەمینەوە؛ کۆمەو بوون ☲ خم شدن

**نەمێر** / nemêr/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **ناپیاو** ٢. نەپیاو؛ تایبەتمەندی پیاوێ توانای سەرجێیی کردنی نییە ☲ ١. ☜ **ناپیاو** ٢. ویژگی مردی کە نیروی جماع ندارد

**نەن** / nen/: ☜ **نەنك**

**نەناباخی** / nenabaxî/: ☜ **نەعنا**

**نەناس**[1] / nenas/: ئاوەڵناو. نەشناس؛ نەژناس؛ نەنیاس؛ لاوەکی؛ بێگانە ‹دارا و نەدار، بڵند و نزمان/ زانا و نەزان، نەناس و خزمان «هەژار، *مەم و زین*»› ☲ ناشناس

▣ **نەدیک و نەناس**: ☜ **نەدیک**

**. نەناس**[2]: پاشەوشە. ـ نەشناس؛ ـ نەژناس؛ نەزان ‹خوانەناس؛ حەقنەناس؛ ئەمەکنەناس› ☲ ـ نشناس

**نەناسراو** / nenasraw/: ئاوەڵناو. غەریبە؛ نەناس؛ نەناسیاو؛ بیانی ☲ غریبە؛ ناشناس

**نەناسیاو** / nenasyaw/: ☜ **نەناسراو**

**نەنک** / nen(i)k/: ناو. نەن؛ نەنە؛ نەنێ؛ نینی؛ نێکێ؛ دایەگەورە؛ دایەخانم؛ دایکی دایک و باب ‹نەنکم زۆر پیرە› ☲ مادربزرگ

**نەنگ** / neng/: ناو. عەیب؛ شوورەیی ‹ئێوە ئەو عەرشەی بە خوێن گوڵڕەنگە/ سەجدەی بۆ دەبەن هیچ نالێن نەنگە «پیرەمێرد»› ☲ ننگ؛ عار

**نەنگواز** / nengwaz/: ئاوەڵناو. دژوار؛ چەتوون؛ سەخت ‹شەوێکی نەنگواز بوو بۆم› ☲ دشوار؛ سخت

**نەنگەویست** / nengewîst/: ☜ **نەگەویس**

**نەنگین** / nengîn/: ئاوەڵناو. ئابڕووبەر؛ ئابڕووبەرە؛ هۆی شەرمەزاری، سەرشۆڕی و بێ‌ئابڕوویی ‹کردەوەی نەنگین› ☲ ننگین

**نەنۆ** / neno/: ناو. بێچووە مەیموون ☲ بچە میمون

**نەنوک** / nenûk/: ☜ **نینۆك**

**نەنوکبڕ** / nenûkbiř/: ☜ **نینۆکبڕ**

**نەنوکگر** / nenûkgir/: ☜ **نینۆکبڕ**

**نەنوکهیشک** / nenûkhîşk/: ناو. *[کینایە]* ڕژد؛ ڕەزیل؛ چرووک؛ چکوود؛ چکووس ☲ خسیس

**نەنە** / nene/: ☜ **نەنك**

**نەنیاس** / nen(i)yas/: ☜ **نەناس**

**نەنێ** / nenê/: ناو. ١. ☜ **نەنك** ٢. وشەی بانگ

کردنی نەنک ▤ ١. ☜ **نەنك** ٢. کلمەی صدا زدن مادر بزرگ

**نەنێر نەمێ** / ne nêr ne mê/: ☜ **نێرەمۆك**[٢]

**نەنێر نەمێو** / ne nêr ne mêw/: ☜ **نێرەمۆك**[٢]

**نەو**[١] / new/: ناو. نا؛ نەئا؛ نەخێر ▤ نە؛ نەخیر

**نەو**[٢]: ☜ **نوێ**

**نەو**[٣]: ئاوەڵکار. نا؛ نەئا؛ نەخێر ▤ نە؛ نەخیر

**نەو**[٤]: پێشوشە. نۆ-: ١. بە نۆ دانە/ پاژ/ بەشەوە ‹نەوقات؛ نەولا؛ نەولەت› ٢. نۆ؛ تازە- ‹نەوبەهار› ▤ ١. نُه- ٢. نو

**نەو**[٥]: ئامراز. لە ▤ از

**نەوا**[١] / newa/: ناو. ١. ئەنوا؛ پەناگا ٢. دەنگ و ئاوازە ٣. هێز و تابشت ٤. هەوای ستران ٥. ژن و کیژی جلکساز و تەیار ٦. کیژی تازە پێگەیشتوو ▤ ١. پناهگاه ٢. آواز ٣. تاب و توان ۴. آهنگ؛ نوا ۵. خانم خوشپوش ۶. دوشیزەی تازەبالغ

**نەوا**[٢]: ☜ **نوێ**

**نەوا**[٣]: نزا. نەک؛ نەکا؛ نەبادا ‹هەی داد هەی بێداد کام خاک وە سەر کەم/ نەوا لەی دنیا قەتحی نەزەر کەم «فولکلۆر»› ▤ مبادا

**نەوات** / newat/: ☜ **نەبات**

**نەواچی** / newaçî/: ناو. هەوای ستران ڕێکخەر ‹لە سەر بەرگی گوڵێکی باغی حوسنت/ هەزار گوڵچینی بێبەرگ و نەواچین «نالی»› ▤ آهنگساز

**نەوار** / newar/: ناو. ١. پارچە شریتی تەنک و پانکەڵە ٢. شریت؛ کاسێت ▤ ١. نوار ٢. کاسِت

**نەوارتن** / newartin/: چاوگ. هەڵنەهاتن (وەک هەویر و...) ▤ ورنیامدن (خمیر و ...)

**نەوارچەسپ** / newarçesp/: ناو. باریکەیەکی یەکلا چەسپ (لە جنسی سیلوولۆز، پارچە، کاغەز یان پلاستیک) بۆ چەسپکاری وشک ▤ نوار چسب

**نەوارقەلب** / newarqelb/: ناو. شریتی دڵ؛ شریتێ کە جووڵەی ماسوولکەکانی دڵ (وەکوو چەند هێلی بان و خوار) لە سەری تۆمارکراوە ▤ نوار قلب

**نەوازش** / newaziş/: ناو. نەوازشت: ١. لاوە؛ کار و ڕەوتی حاواندنەوە؛ لاواندنەوە؛ هەڵس‌وکەوتی ئاوێتە لەگەڵ خۆشەویستی و بەزەییدا ٢. کاری پەلاندن؛ بە ئەسپایی و میهرەبانی، دەست پێدا هێنان؛ دەست بە سەردا کێشان ▤ ١و٢. نوازش

**نەوازشت** / newaziṣt/: ☜ **نەوازش**

**نەوازە** / newaze/: ☜ **نەخوازە**

**نەوال** / newal/: ناو. ١. ☜ **نوال** ٢. لافاوی توانەوەی بەفر لە چیا ▤ ١. ☜ **نوال** ٢. سیلاب حاصل از آب شدن برفها

◙ **نەوالی کورک**: مەنداو لە چیادا ▤ جای آب جمع شده در کوه

**نەواڵ** / newał/: ☜ **نوال**

**نەواڵە** / newałe/: ناو. بابۆڵە؛ قەواڵە؛ ساندویچ ▤ ساندویچ

**نەواڵەفرۆش** / newałef(i)roş/: ناو. ساندویچی؛ نەواڵەیی ▤ ساندویچی

**نەواڵەیی** / newałeyî/: ☜ **نەواڵەفرۆش**

**نەوان**[١] / newan/: چاوگ. ١. هاتنە خوار؛ نزم بوونەوە ٢. چەمانەوە؛ چەمیانەوە ▤ ١. فرود آمدن ٢. خم شدن

**نەوان**[٢]: ☜ **نەبان**

**نەوانایی** / newanayî/: ☜ **نەخوێندەواری**

**نەواندن** / newandin/: چاوگ. ١. هاوردنە خوار؛ نزم کردنەوە ٢. چەماندنەوە؛ چەماننەوە ▤ ١. فرود آوردن ٢. خم کردن

**نەوانی** / newanî/: ناو. ١. قورەکاری ٢. پینە و پەڕۆی دیوار و کەلپەل ▤ ١. کار بنایی ٢. تعمیرات منزل

**نەواون** / newawin/: ☜ **نەبان**

**نەوای** / neway/: ☜ **نەوەد**

**نەوایین** / newayîn/: ☜ **نەوەدەمین**

**نەوب** / newb/: ☜ **نۆرە**

**نەوبنەو** / newb(i)new/: ئاوەڵکار. تازەبەتازە؛ نفتونەو؛ نستونوێ ☰ تازه به تازه

**نەوبە** / newbe/: ☜ **نۆرە**

**نەوبەدار** / newbedar/: ناو. ئێشکگر؛ جەزایرچی ☰ عسس؛ نگهبان شبانه

**نەوبی** / newbî/: ☜ **نەدیبدی**

**نەوت** / newt/: ناو. نەفت: ١. تراوێکی خەستی بۆگەنە بە ڕەنگی قاوەیی تۆخ لە ژێر زەویدا، بریتی لە تێکەڵاوی چەند هیدرۆکەربون وەک هیگزان، هیپتان، ئۆکتان و ماکی ئالیتر کە لە پاڵاوتنی زۆر شتی جۆراوجۆر بەرهەم دێ ٢. نەوتی سپی؛ نەوتی چرا ☰ ١. نفت خام ٢. نفت سفید

**نەوتاوی** / newtawî/: ئاوەڵناو. نەفتاوی؛ نەوتینە؛ نەوتی؛ بە نەوتەوە تلاو ☰ نفت‌آلود

**نەوتخانە** / newtxane/: ناو. نەفتخانە؛ کان و بیرە نەوت ‹نەوتخانەی کەرکووک› ☰ چاه نفت

**نەوتی**[1] / newtî/: ناو. ١. کانگای نەوت ٢. نەفتفرۆش ☰ ١. کان نفت ٢. نفت فروش

**نەوتی**[2]: ئاوەڵناو. ١. لە جنسی نەوت ٢. بە نەوتەوە تلاو ☰ ١و٢. نفتی

**نەوتینە** / newtîne/: ئاوەڵناو. نەوتاوی؛ بە نەوتەوە تلاو ☰ نفت‌آلود

**نەوجوان** / newc(i)wan/: ☜ **نۆجوان**

**نەوچە** / newçe/: ناو. ١. لاو؛ جحێڵ ٢. وەچێ کە لە قەدی چڵ هەڵداتەوە ☰ ١. جوان ٢. جوانه‌ی بر شاخه زده

**نەودارە** / newdare/: ناو. شاگردانە؛ دەسخۆشانە ☰ شاگردانه

**نەور** / newr/: ناو. نەورایی؛ نەورم؛ ناوگەڕ؛ دەشتایی بە چوار دەورەیدا چیا ☰ زمین هموار در میان کوهستان

**نەوراتن** / newratin/: چاوگ. نەوارتن؛ هەڵنەهاتن (هەویر) ☰ ورنیامدن (خمیر)

**نەورایی** / newrayî/: ☜ **نەور**

**نەورشتە** / newrişte/: ئاوەڵناو. نەبرژاو؛ نەبرژیاگ ☰ نابرشته

**نەورم** / newrim/: ☜ **نەور**

**نەورنایە** / newrnaye/: ئاوەڵناو. نەخش‌کراو بە دورمان ☰ گلدوزی شده

**نەورنایش** / newrnayîş/: چاوگ. بە دورمان نەخش لە پارچە کردن ☰ گلدوزی کردن

**نەورۆ** / newro/: ناو. سەردەمی جووت بوونی پشیلە ☰ موسم جفتگیری گُربه

**نەورۆز** / newroz/: ناو. نەڤرۆز: ١. ڕۆژی سەرساڵ؛ سەرەتای بەهار ‹ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە/ جەژنێکی کۆنی کوردە، بە خۆشی و بە هاتەوە «پیرەمێرد»› ٢. خاکەلێوە؛ یەکەم مانگی بەهار ☰ ١. نوروز ٢. فروردین

**نەورۆزانە**[1] / newrozane/: ناو. ١. جێژنەپیرۆزەی نەورۆز ٢. جێژنانەی نەورۆز ☰ ١. تبریک عید نوروز ٢. عیدی نوروز

**نەورۆزانە**[2]: ئاوەڵکار. لە دەمی نەورۆزدا؛ سەرەتای بەهار ‹نەورۆزانە کاتێ پەلەوری کۆچەر لە گەرمێنەوە دێنەوە، ... «شەریف»› ☰ اوان نوروز

**نەورۆزمانگ** / newrozmang/: ناو. خاکەلێوە؛ یەکەمین مانگی ساڵی هەتاوی ☰ فروردین

**نەورۆزنامە** / newrozname/: ناو. بەیتێ کە بۆ نەورۆز گوترابێ ☰ چکامه‌ی به مناسبت نوروز

**نەورۆزە**[1] / newroze/: ناو. نەورۆزی؛ گوڵەنەورۆزە ☰ گُلی است

**نەورۆزە**[2]: ئاوەڵناو. نەورۆزی؛ پێوەندیدار بە نەورۆزەوە ☰ نوروزی

**نەورۆزی** / newrozî/: ☜ **نەورۆزە**[2]

**نەورە** / newre/: ناو. دارو؛ دەرمان حەمام ☰

واجبی

**نەوریان** / newiryan/: ناو. مەگیرانی؛ بێزوو؛ بێزی؛ کەرب ☰ ویار

**نەوڕ**[1] / newiř/: ناو. هەودای پتەو و نەپس ☰ نخ مُحکم

**نەوڕ**[2]: ئاوەڵناو. نەپس؛ تایبەتمەندی هەودا یا هەر شتێ کە نەپسێ ☰ ویژگی نخ یا شئ مُحکم

**نەوڕەس** / newřes/: ناو. ماسیخۆرە؛ ماسیگرە ☰ قاق؛ مُرغ ماهیخوار

**نەوڕەسیدە** / newřesîde/: ئاوەڵناو. نەوڕەسیە؛ تازە پێگەیشتوو ☰ نورسیده

**نەوڕەسیە** / newřes(i)ye/: ☜ **نەوڕەسیدە**

**نەوز** / newz/: ☜ **نەوژ**

**نەوزا** / newza/: ☜ **نەوزاد**

**نەوزاد** / newzad/: ناو. نووزا؛ نووزاک؛ نەوزا؛ ساوا؛ کۆرپە؛ منداڵی تازە لە دایک بوو ☰ نوزاد

**نەوژ** / newj/: ناو. ناز؛ ناژ؛ ناژۆ؛ ناژو؛ ناژین؛ نەوز؛ ناژوو؛ ناجوو؛ سنەوبەر؛ ناوی چەند جۆر داری هەمیشە سەوزی سەردەسێرە بە گەشەی خێراوە کە چێوەکەی لە پیشەسازیدا کەڵکی زۆرە ☰ صنوبر

**نەوژن** / newjin/: ☜ **نوێن**[1]**-٢**

**نەوژەن** / newjen/: ☜ **نوێن**[1]**-٢**

**نەوس** / news/: ناو. ١. نەفس ٢. ئیشتیای خواردن ☰ ١. نفس ٢. اشتهای خوراک

▣ **نەوس چوونە سەر شتێک** *(مەجاز)* ئیشتیای خواردنی شتێک کردن ☰ اشتهای چیزی کردن

**نەوس وە بەر پێ کەوتن:** دۆعایەکە، واتە نەوست لە تاو کەوێ و کز بێ ‹نەوست وە بەر پێ کەوێ ڕۆڵە، دەڵێی هیچی نەخواردووە!› ☰ دُعا، بە معنی «اشتهایت کور شود»

**نەوسک** / newsik/: ناو. خانووی لە کێو داتاشراو ☰ خانەی تراشیدە در کوە

**نەوسن** / newsin/: ئاوەڵناو. چڵێس ☰ شکمو

**نەوسنی** / news(i)nî/: ناو. چڵێسی ☰ شکمپرستی

**نەوش**[1] / newş/: ناو. تۆرەمە؛ نەسڵ ☰ نسل

**نەوش**[2]: ئاوەڵناو. نۆش؛ گوارا؛ لە گیان خۆش ‹نەوشی گیانت بێ!› ☰ گوارا

**نەوشاتر** / newşatir/: ☜ **نۆشادر**

**نەوشە** / newşe/: ناو. هۆنە؛ هەڵبەست؛ شیعر ☰ شعر

**نەوشەکار** / newşekar/: ناو. هەستیار؛ شایەر؛ شاعیر؛ هۆزان ☰ شاعر

**نەوع** / new'/: ناو. جۆر ☰ نوع

**نەوق**[1] / newq/: ناو. ١. خاڵیگە؛ بەتاڵایی لاتەنشت ٢. قەد؛ ناوەڕاستی لەش و ... ☰ ١. تُهیگاه ٢. میان؛ کمر

▣ **نەوقی چیا:** بڕوار؛ گەوە؛ قەدی کێو؛ ناوقەدی چیا ☰ کمر کوە

**نەوق**[2]: ☜ **نوقم -١**

**نەوک** / newk/: ناو. ئەوک؛ قوڕگ ☰ گلو

**نەوکە** / newke/: ناو. ١. ☜ **نوها** ٢. نووکەنووک ☰ ١. ☜ **نوها** ٢. نکانک

**نەوکین** / newkîn/: چاوگ. نووکە کردن ☰ نکانک کردن

**نەوگ** / newig/: ناو. ١. نەوو؛ نەووو؛ کولاو؛ لباد؛ تەخت ٢. نەوە؛ فرزەندی فرزەند ٣. نەبوو؛ چنا ☰ ١. نمد ٢. نوه ٣. عدم

**نەوگماڵ** / newigmał/: ناو. لەبوچی؛ کولاف کەر؛ ئەو کەسەی بەرگن دەپەستێوێ و دەیکاتە لباد ☰ نمدمال

**نەوگین** / new(i)gîn/: ئاوەڵناو. لە جنسی نەوگ ‹پاشماوەی ئەوان بۆ هۆزی کوردان/ تەپلەی نەوگینە و فەقیانەیێ پان «قانع»› ☰ نمدین

**نەولا** / newla/: ئاوەڵناو. نۆ ئەوەندە ☰ نُه برابر

**نەولەت** / newlet/: ناو. ١. زارۆی نۆهەم ٢. دایکی

نۆ منالْ 🇮🇷 ١. فرزند نُهم ٢. مادر نُه بچه

**نەون**[١] / newn/: ناو. نۆڕیزکێنە؛ گەمەیەکە بە نۆ چەو دەکرێ 🇮🇷 از بازی‌ها

**نەون**[٢]: ☜ **نۆهەم**

**نەوندە** / newinde/: ئاوەڵناو. بارانڕست؛ گەنم و جۆی بە باران شین بوو 🇮🇷 گندم و جَوی که با بارش باران می‌روید

**نەونەمام**[١] / newnemam/: ناو. ١. ☜ **نۆنەمام** ٢. [کینایە] تازە لاوی جوان ‹دیدەم نەونەمام! دیدەم نەونەمام!/ دیدەڕاستەکەم! بالا نەونەمام! «قانع»› 🇮🇷 ١. ☜ **نۆنەمام** ٢. جوان رعنا

**نەونەمام**[٢]: ئاوەڵناو. شلک؛ ناسک؛ تورت؛ تەرچک و تازە ‹دیدەم نەونەمام! دیدەم نەونەمام!/ دیدەڕاستەکەم! بالا نەونەمام! «قانع»› 🇮🇷 بُلند و تُرد و نازک

**نەونەو** / newnew/: ئاوەڵکار. ١. نۆ جار نۆ ٢. نوێ نوێ؛ تازەی تازە 🇮🇷 ١. نُه بار نُه ٢. کاملاً نو

**نەوو** / newu/: ناو. نەوگ؛ نمەد؛ لباد 🇮🇷 نمد

**نەووەت** / newwet/: ئاوەڵناو. نەگبەت؛ نامەت؛ بەدبەخت 🇮🇷 نکبتی

**نەوو** / newû/: ناو. ١. نەبووگ؛ دۆخی نەبوون ٢. ☜ **نەوگ ـ١** 🇮🇷 ١. نیستی؛ عدم ٢. ☜ **نەوگ ـ١**

**نەووکە** / newûke/: ئاوەڵناو. زۆر ناسک و تەنک 🇮🇷 بسیار نازُک و تُنُک

**نەوە** / newe/: ناو. ١. نەڤی؛ کوڕەزا و کچەزا؛ پشتی دووهەم ٢. ☜ **نوها** ٣. کاری نەزانانە ٤. نۆرە؛ نۆبە 🇮🇷 ١. نوه ٢. ☜ **نوها** ٣. کار ناشیانه ۴. نوبت

**نەوەت** / newet/: ☜ **نەوەد**

**نەوەتە** / newete/: ☜ **نۆرە**

**نەوەد** / newed/: ناو. نەوت؛ نۆتی؛ نۆد؛ نۆهەت؛ نەوای؛ نەوەت؛ نەهوویت؛ ژمارەی سەرەکی پێش نەوەدویەک و دوای هەشتاونۆ 🇮🇷 عدد نود

**نەوەدڵ** / newedił/: ☜ **نابەدڵ**

**نەوەدڵی** / newediłî/: ئاوەڵکار. زۆرەکی؛ بە زۆر؛ زۆرەملێ 🇮🇷 زورکی

**نەوەدەم** / newedem/: ئاوەڵناو. نۆتەم؛ دەنگی دوای هەشتاونۆیەم 🇮🇷 نَوَدُم

**نەوەدەمین** / newedemîn/: ئاوەڵناو. نۆدەمین؛ نۆدەهەمین؛ نوتەمین؛ نەوایین 🇮🇷 نَوَدُمین

**نەوەر**[١] / newer/: ناو. قەرەچ؛ قەرەچی 🇮🇷 کَولی

**نەوەر**[٢]: ئاوەڵناو. نەڤی؛ نزم؛ نەوی 🇮🇷 پست

**نەوەرا** / newera/: ئاوەڵکار. نەوەرنا؛ لە سەرڕا؛ سەرلەنوێ 🇮🇷 از نو

**نەوەرد**[١] / newerd/: ناو. نەوەرە؛ داری چوارپاڵوو کە جۆلا بووزووی لێ دەپێچێ 🇮🇷 قرقرەی شالباف

**نەوەرد**[٢]: ☜ **نەبەرد**

**نەوەرنا** / newerna/: ☜ **نەوەرا**

**نەوەرە** / newere/: ☜ **نەوەرد**[١]

**نەوەز** / newez/: ☜ **نەبەز ـ١**

**نەوەزا** / neweza/: ناو. نەتیجە؛ فرزەندی نەوە 🇮🇷 نتیجه

**نەوەزازا** / newezaza/: ناو. نەبیرە؛ نەڤی چڕک؛ نەوەی نەوە 🇮🇷 نبیره

**نەوەژن** / newejin/: ناو. نگوونک؛ نینگوون؛ بەرکەڵ؛ گوێرەکەی مێوی سێ ساڵە 🇮🇷 گوساله‌ی سه ساله

**نەوەسە** / newese/: ☜ **نەخۆش**

**نەوەش**[١] / neweş/: ☜ **نەخۆش**

**نەوەش**[٢]: ئاوەڵناو. ناسازگار 🇮🇷 ناخوش؛ ناسازگار

**نەوەک** / newek/: نزا. نەوەکوو؛ نەوەکا؛ نەوەکوونێ؛ نەوەکی؛ نەوەکینێ؛ نەک؛ مەبادا؛ نەبادا ‹شکاری وەحشییان بەس دەستەمۆ کەن/ نەوەک بەر بێ شکاری خانەزاتان! «نالی»› 🇮🇷 مبادا

**نەوەکا** / neweka/: ☜ **نەوەك**

**نەوەکام** / newekam/: ☜ **نەبەکام**

**نەوەکو / newekû/:** ☜ **نەوەك**

**نەوەکونێ / newekûnê/:** ☜ **نەوەك**

**نەوەکی / newekî/:** ☜ **نەوەك**

**نەوەکینێ / newekînê/:** ☜ **نەوەك**

**نەوەن[1] / newen/:** ناو. گوێلپار؛ پارێن ⇐ گوسالەی نر دو سالە

**نەوەن[2]:** ئاوەڵناو. قۆچاخ؛ شاتر؛ خێرا لە ڕێگە ڕۆیشتن ⇐ تیزپا

**نەوەند / newend/:** ناو. خەفتان؛ تۆی درەنگ چێنراوی پاییز ⇐ بذر دیر کاشته در پاییز

**نەوەندە / newende/:** ناو. کاری کێلان و توو چاندن لە جێگە بێستان و شیناوەرد لە پاییزدا ⇐ کشت پاییزی

**نەوەنگە / newenge/:** ناو. دەمڕاست؛ نوێنەری خەڵک لە دام و دەزگای دەوڵەتدا ⇐ وکیل؛ نماینده

**نەوەنەوە / newenewe/:** ئاوەڵناو. تازە تازە؛ نوێ نوێ ⇐ کاملاً تازه

**نەوەیی / neweyî/:** ناو. تەرچکی و تازەیی ⇐ تر و تازگی

**نەوهاڵ / newhał/:** ناو. ١. تازەلاو؛ نۆجوان ‹با وەس تەمای وەسڵ نازک نەوهاڵان/ سەرمایەی عومرت بدۆ وە تالان «مەولەوی»› ٢. نۆنەمام ⇐ ١. نوجوان ٢. نونهال

**نەوهاڵی / newhałî/:** ناو. تازەلاوی؛ لاوکی ⇐ نوجوانی

**نەوی / newî/:** ئاوەڵناو. نەڤی؛ نەمە؛ نوی؛ نڤی: ١. کورت؛ کۆتا؛ قوڵە ‹لەوەتی من هەم، سەرنجم داوە/ ڕێگەی گولگولی تەخت و بەخت و کام/ بە بن کەوانەی تاقێکدا دەڕوا/ کە نەویترە لە خاچی بالام «پەشێو»› ٢. [کینایە] بێ‌نرخ؛ سووک و چرووک ⇐ ١. کوتاه ٢. کم‌ارزش

⊡ **نەوی بونەوە:** ١. نزم بوونەوە؛ هاتنە خوار ٢. داچەمان؛ چەمانەوە؛ کۆمەو بوون ⇐ ١. فرود آمدن ٢. خم شدن

**نەویایەتی / new(i)yayetî/:** ناو. نزمایی؛ نزمی ⇐ پستی

**نەویرە / newîre/:** ناو. نەبیرە؛ نەوەزازا؛ نەڤی چرک ⇐ نبیره

**نەویس / newîs/:** ☜ **نەگەویس**

**نەویست / newîst/:** ☜ **نەگەویس**

**نەوین[1] / newîn/:** چاوگ. تێنەپەڕ. //نەویت؛ دەنەوی؛ بنەوە// ١. پر پێدا کردن (پێرای پیتی «لێ») ‹لێ نەوین› ٢. کۆمیانەوە؛ چەمانەوە ‹شوولی باریک کە هەموو پێکەوە بایدەن، پتەون/ با هەموو دەست بگرین پێکەوە، تاکوو نەنەوین «ئاوات»› ٣. نەوی بوون؛ تەپین؛ قوپان ‹سەربانەکە لە دوو لاوە نەویوە› ⇐ ١. قاپیدن ٢. خم شدن ٣. گود افتادن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەنەوین

**نەوین[2]:** ئاوەڵناو. کوێر؛ کۆرە ⇐ کور؛ نابینا

**نەوینەوە / newînewe/:** چاوگ. داهاتن؛ چەمینەوە ⇐ خمیدن

**نەویەس / newiyes/:** ☜ **نۆزدە**

**نەوێر / newêr/:** ئاوەڵناو. نەوێرک؛ نەوێرۆک؛ نەوێرەک؛ ترسەنۆک؛ ترسەزاوەر ⇐ بُزدل؛ ترسو

**نەوێران / newêran/:** ☜ **وێران**

**نەوێرک / newêrik/:** ☜ **نەوێر**

**نەوێرۆک / newêrok/:** ☜ **نەوێر**

**نەوێرەک / newêrek/:** ☜ **نەوێر**

**نەوێژ / newêj/:** ئاوەڵناو. کەم‌قسە ⇐ کم‌حرف

**نەوێژیاگ / newějyag/:** ☜ **نەگوتە**

**نەوێس[1] / newês/:** ☜ **نۆزدە**

**نەوێس[2]:** ☜ **نەوێستاو**

**نەوێساو / newêsaw/:** ☜ **نەوێستاو**

**نەوێست / newêst/:** ☜ **نەوێستاو**

**نەوێستاو[1] / newêstaw/:** ئاوەڵناو. نەوێس؛

نەوێســـت؛ نەوێســـاو؛ نەوێســـیاگ: ١. بـــزۆز و ئۆقرەنەگر ‹یـەکجار هـار و نەوێسـتاوە› ٢. /مەجاز/ مانـدوویی‌نـەناس؛ چـالاک ‹لاوێکـی نەوێسـتاو و تێکۆشەرە› ☰ ١. بی‌قرار؛ ناآرام ٢. خستگی‌ناپذیر

• **نەوێستاو**[٢]: پاشەوشە. نەپارێز؛ هۆش لـە خـۆ بـڕاو ‹دەستنەوێستاو› ☰ ناپرهیز

**نەوێسیاگ** /newêsyag/: ☜ **نەوێستاو**

**نەه** /neh/: ☜ **نۆ**[١]**ـ١**

**نەها**[١] /neha/: ناو. ١. ☜ **نوها** ٢. ☜ **نـۆك ـ١** ٣. شت؛ تشت؛ چت ☰ ١. ☜ **نوها** ٢. ☜ **نـۆك ـ١** ٣. چیز

**نەها**[٢]: ☜ **نۆهەم**

**نـەهات** /nehat/: نـاو. نەگبـــەتی؛ ڕۆژڕەشـــی ‹سەفەرمان چونکە ڕێی هات و نەهاتـە/ دوعامـان بـۆ بکـەن، ئێـوە و خوداتـان! «نـالی»› ☰ بـدبختی؛ بدشانسی

**نـەهاتی** /nehatî/: نـاو. نـــەهات؛ نەهامـــەت؛ بەدبـەختی ‹ئەگـەر نەهاتـی هـات، پەلـوو ددان دەشکێنێ! «مەسەل»› ☰ بدشانسی

**نـەهار** /nehar/: نـاو. ١. نهـار؛ شـین؛ شـەپۆڕ؛ چەمەرە ٢. فراوین؛ نـانی نیـوەڕۆ ☰ ١. شـیون ٢. ناهار

**نەهاری** /neharî/: ناو. شینگێڕ؛ مردوولاوێنـەوە ☰ نوحەخوان

**نەهال** /nehal/: ☜ **نوال**

**نەهامەت**[١] /nehamet/: ☜ **نەهاتی**

**نەهامەت**[٢]: ئاوەڵناو. نەگبەت؛ بەدبەخت؛ چارەڕەش ☰ سیەروز

**نەهامەتی** /nehametî/: ناو. بەلا؛ نەشس؛ نشست ☰ بدبیاری

**نەهان** /nehan/: ناو. بـەراورد؛ خـەمڵ ☰ بـرآورد؛ تخمین

**نەهاندن** /nehandin/: چاوگ. نرخاندن؛ بـەراورد کردن ☰ تخمین زدن؛ برآورد کردن

**نەهبەرک** /nehberik/: ناو. گەمەی نـۆڕیزکێن ☰ نوعی بازی با شن

**نەهتک** /nehtik/: ☜ **نەعتك**

**نەهتن** /nehtin/: چاوگ. هەڵبەست هۆنینـەوە ☰ شعر سرودن

**نەهش** /nehiş/: ئاوەڵناو. نهش؛ بێهۆش؛ دڵبووراوە ☰ مدهوش؛ بیهوش

**نەهشی** /nehşî/: ناو. گەللایی؛ بێ‌هۆش و گۆشی؛ دۆخـی گـوێ‌نـەدان بـە کـار و ئامۆژگـاری ☰ کم‌هوشی و بازیگوشی

**نەهشین** /nehşîn/: ئاوەڵناو. گەوج؛ حۆل ☰ ابله

**نەهفاندن** /nehfandin/: چاوگ. نەهفین؛ قـازانج کردن؛ فێدە کرن؛ سـوود دەس کـەوتن ☰ سـود بردن

**نەهفین** /nehfîn/: ☜ **نەهفاندن**

**نەهک** /nehik/: ☜ **نۆك ـ١**

**نەهگۆن** /nehgon/: ☜ **نوێن**[١]**ـ٢**

**نەهلک** /nehlik/: ناو. زچێن؛ گەمەی نۆڕیزکێن ☰ نوعی بازی با شن

**نەهلە** /nehle/: ناو. ئاوایی لە ناو شیوی بەرفرەهدا ☰ روستای واقع در درّەی گشاد

**نەهوراندن** /nehurandin/: چـاوگ. ١. ویرەویـر کـردن؛ لاوژە بـە دەنگـی نـزم گـوتن ٢. خـەم ڕەواندنەوە ☰ ١. زمزمه کردن ٢. شاد کردن

**نەهوویت** /nehûyt/: ☜ **نەوەد**

**نەهە** /nehe/: ناو. ١. ☜ **نێوك ـ١** ٢. ☜ **نوها** ٣. ☜ **نۆك ـ١**

◙ **نەهـەی سیا**: نۆکەڕەشـــە؛ نـــۆکی ڕەش ☰ نخودسیاه

**نەهەز** /nehez/: ☜ **ناحەز**

**نەهەق** /neheq/: ☜ **ناحەق**

**نەهەقەی** /neheqey/: ☜ **ناحەقی**

**نەهەک** / nehek/: ناو. ۱. نۆمینە؛ ڕۆژی عارەفە ۲. مانگی قوربان ۳. پاژێک لە نۆ پاژ؛ بەشێک لە نۆ بەش ☰ ۱. روز نهم ماه ذیحجه ۲. ماه ذیحجه ۳. یک نُهُم

**نەهەم** / nehem/: ☜ نۆهەم

**نەهەمهەڤ** / nehemhev/: ئاوەڵناو. بێ هاوتا؛ تاقانە؛ بێوێنە ☰ بی‌مانند

**نەهەمین** / nehemîn/: ☜ نۆهەمین

**نەهەنگ** / neheng/: ناو. ۱. گەورەترین گیانداری زەوی کە گوانداریکی ئاوژییە و لە ماسی دەچێ، گۆشتی دەخۆن و ڕۆنەکەشی بۆ دەرمان بەکەڵکە ۲. جەفەنگ؛ گەپ و گاڵتە ☰ ۱. نهنگ ۲. شوخی و تفریح

**نەهی** / nehî/: ناو. *[ئیسلام]* قەدەغەی شەرعی ☰ نهی

**نەهیڤەزاگرۆسی** / nehîvezagrosî/: ناو. ڕەشەهەرجنک؛ ڕەشەئەرژەن؛ هەجنەبایەم ☰ سیاه‌توسه

**نەهین** / nehîn/: ئاوەڵناو. فێرنەبوو ☰ نیاموخته

⊡ **نەهین بوون**: فێر نەبوون؛ بە نەزانی مانەوە ☰ یاد نگرفتن

**نەهیو** / nehîw/: ناو. گەف؛ گوڕەشە ☰ تهدید؛ نهیب

**نەهێڕ** / nehêř/: ئاوەڵناو. سواو؛ سیویاگ (بەرداش) ☰ ساییده (سنگ آسیا)

**نەهێڕای** / nehêřay/: ئاوەڵناو. بە ئارد نەکراو ☰ آردنشده

**نەهێن**[1] / nehên/: ناو. سڕ؛ ڕاز ☰ راز

**نەهێن**[2]: ئاوەڵناو. پەنامەکی؛ شاراوە؛ داشاریاگ ☰ نهان

**نەهێنبڕ** / nehênbiř/: ئاوەڵناو. نهێنبڕ: ۱. ڕکوونی؛ قینەون؛ بوغزلەزگ ۲. دەخەس؛ دەبنەوەبڕ ☰ ۱. کینه‌توز ۲. تودار

**نەهێندڕ** / nehêndiř/: ☜ نەهێنگر

**نەهێنگر** / nehêngir/: ئاوەڵناو. نەهێندڕ؛ نهێنگر؛ نهێندڕ: ۱. یانی‌گر؛ تایبەتمەندی سەگێ کە لەپڕ و بێدەنگ خەڵک بگرێ ۲. *[کینایە، پلار]* ڕکوونی؛ قینەون؛ بوغزلەزگ ☰ ۱. ویژگی سگی که بدون پارس کردن گاز می‌گیرد ۲. کینه‌توز

**نەهێنی**[1] / nehênî/: ناو. سڕ؛ سوڕ ☰ راز؛ سِر

**نەهێنی**[2]: ئاوەڵناو. نادیار؛ شاراوە «هەر ئەمشەو ڕێیەکی شینباوی نەهێنی/ ئەمباتە کەناری ئەو گۆمەی تەنیشتمان «شێرکۆ»» ☰ پنهانی؛ سّری

**نەهێنی**[3]: ئاوەڵکار. پەنامەکی؛ بە دزییەوە ☰ پنهانی

**نەی**[1] / ney/: ناو. ۱. داو؛ تاڵ ۲. بلوێر؛ بلوور ۳. زەل؛ قامیش؛ چیتک ٤. نا؛ نەخێر ☰ ۱. تار؛ رشته ۲. نی‌لبک ۳. نی ۴. نه؛ خیر

**نەی**[2]: ئامراز. *[سورکەلە]* لە ئەم «مەر ئازیز وە خەیر تەشریف باوەرۆ/ نەی گێجاوی خەم دەسگیریم کەرۆ «مەولەوی»» ☰ در این

**نەیار** / neyar/: ئاوەڵناو. دژ؛ دوژمن «بۆ یەکتری دوژمن و نەیارن/ بۆ نۆکەریی تا بڵەی لەبارن! «هەژار، *مەم و زین*»» ☰ دُشمن

**نەیارەش** / neyareş/: ناو. قەرەنەی؛ کلارینێت ☰ قرەنی

**نەیاری** / neyarî/: ناو. دوژمنی ☰ دُشمنی

**نەیاییش** / neyayîş/: چاوگ. نیان؛ دانان؛ دانران ☰ نهادن

**نەیبی** / neybî/: ☜ نەدیبدی

**نەیجور** / neycur/: ☜ نەیژە

**نەیجە** / neyce/: ☜ نەیژە

**نەیچک** / neyçik/: ☜ نەیژە

**نەیچە** / neyçe/: ناو. ۱. ☜ نەیژە ۲. کورتە چیتکێ ☰ ۱. ☜ نەیژە ۲. قطعه‌ای از نی

**نەیچی** / neyçî/: ☜ نەیژەن

**نەیرەڤان** / neyrevan/: ئاوەڵناو. ئاگادار؛ وشیار ☰

ئاگاه

**نەیڕین / neyřîn/:** ☜ **نواڕین**

**نەیزە / neyze/:** ☜ **نیزە**

**نەیژە / neyje/:** ناو. نەیجور؛ نەیجە؛ نەیچک؛ نەیچە؛ جۆرێ قامیشی باریک کە چیغی لێ دروست دەکەن ☰ نی باریک

**نەیژەن / neyjen/:** ناو. نایژەن؛ نەیچی؛ نەیڤان؛ بلوێرژەن؛ بلوورژەن ☰ نی‌نواز

**نەیسە / neyse/:** ئامراز. سا؛ ئیتر؛ هەرچۆنێ بێت ☰ به هر صورت

**نەیشەکر / neyşekr/:** ناو. نەیشەکەر؛ گیای پایای لە تیرەی گەنم بە لقی ئەستوور و هەڵچووی گرێ-گرێوە کە ناوەکەی پڕیەتی لە شەکری ساکاروز، لەم گیایە شەکر بەرهەم دێنن ☰ نیشکر

**نەیشەکەر / neyşeker/:** ☜ **نەیشەکر**

**نەیڤان / neyvan/:** ☜ **نەیژەن**

**نەیل / neyl/:** ناو. نەییل؛ گوێلپاری مێچکە؛ مانگای دوو بەهارە ☰ گوسالەی مادەی دو ساله

**نەینک / neynik/:** ☜ **نوێنک**

**نەینوک / neynuk/:** ☜ **نینۆک**

**نەینۆک / neynok/:** ناو. ١. ☜ **نەینوک** ٢. نەخۆشی تەنگەنەفەسی ولاخەبەرزە ☰ ١. ☜ **نەینوک** ٢. بیماری نفس‌تنگی چارپایان

**نەینوک / neynûk/:** ناو. نەینۆک: ١. ئاوێنە؛ ئاینە ‹ڕووناکی‌دەرم، شەمم، کە فووم لێ کەی، هیچ!/ نەینووکی دەسی جەمم، لە بەردم دەی، هیچ! «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ٢. نینۆک؛ ناخوون ☰ ١. آینه ٢. ناخُن

**نەینەوە / neynewe/:** چاوگ. نەوینەوە؛ داهاتنەوە؛ کۆمەو بوون ☰ خم شدن

**نەیوەی / neywey/:** ☜ **نەدی‌بدی**

**نەیوی / neywî/:** ☜ **نەدی‌بدی**

**نەیوتەپیا / neyûtep(i)ya/:** ئاوەڵکار. لەمەپتر؛ زیاتر لەمە ☰ بیش از این

**نەیی / neyî/:** ئاوەڵکار. هیچکام ☰ هیچکدام

**نەییش / neyîş/:** چاوگ. نیان؛ دانان؛ ڕۆنان ☰ نهادن

**نەییل / neyîl/:** ☜ **نەیل**

**نەیین / neyîn/:** ناو. دژایەتی؛ دوژمنایەتی ☰ مُخالفت

**نەیینی / neyînî/:** ناو. نەبوونی؛ هەژاری ☰ بینوایی

**نەییە / neyiye/:** ☜ **نەدیتە**

**نها[1] / n(i)ha/:** ناو. ١. ☜ **نۆک ـ١** ٢. ☜ **نوها**

**نها[2]:** ☜ **نۆهەم**

**نهار / n(i)har/:** ناو. شین؛ شەپۆڕ؛ چەمەرە ☰ شیون

**نهال / n(i)hal/:** ☜ **نوال**

**نهالی / n(i)halî/:** ناو. نەخالی؛ پەلاس؛ بەڕەی سادە و کەم‌قیمەت ☰ گلیم ارزان قیمت

**نهام / n(i)ham/:** ناو. ١. ☜ **نهۆم** ٢. چین؛ تەبەق ☰ ١. ☜ **نهۆم** ٢. چین

**نهاندن / n(i)handin/:** چاوگ. ١. نان؛ نیان ٢. */کینایە/* ئیلاقە کردن ☰ ١. نهادن ٢. جماع کردن

**نهانی / n(i)hanî/:** ناو. ١. نڤانی؛ بەنایی؛ کاری قوڕەکاری ٢. حەسانگە؛ وچانگا؛ جێگەی سانەوە و ئیسراحەت ☰ ١. بنّایی ٢. استراحتگاه

**نهایەت / n(i)hayet/:** ناو. برانەوە؛ دوایی ☰ نهایت

**نهرز / nihriz/:** ناو. نهریز؛ جۆرێ تیخ بۆ شیر و خەنجەر ☰ نوعی تیغ پرندار

**نهریز / nihrîz/:** ☜ **نهرز**

**نهش / nihş/:** ☜ **نەهش**

**نهشتن / n(i)hiştin/:** چاوگ. نیشتنەوە؛ لە حەواوە هاتنە سەر زەمین ‹تەیر نهشت› ☰ فرود آمدن؛ بر زمین نشستن

**نهشتۆک / n(i)hiştok/:** ناو. فرگە؛ فرۆکەخانە؛ جێگەی نهشتنی باڵداران ☰ فرودگاه

**نهشتی** / n(i)hiştî/: ئاوەڵناو. ١. نشتوو؛ لە حەواوە بۆ سەر زەمین هاتوو ٢. *[مەجاز]* بەوەج؛ سەنگین و گران ☰ ١. فرود آمده ٢. باوقار

**نهک** / nihik/: ناو. قولاب ☰ قُلاب

**نهنگ** / nihing/: ☜ **نزیك**

**نهـو** / n(i)hu/: ئاوەڵکار. هەنگا؛ هەنووکە ☰ هم‌اکنون

**نهـون** / n(i)hun/: ناو. ١. نـۆین؛ جۆگەی سەرپۆشراو ٢. نەغمە؛ ڕێگای بە ژێر زەویدا ☰ ١. آبراه سرپوشیده ٢. نقب

**نهوین** / nihwîn/: ناو. کاریز؛ کاریزە ☰ قنات

**نهۆ** / n(i)ho/: ناو. ١. ☜ **نوها** ٢. نە ☰ ١. ☜ نوها ٢. نه

**• نهۆر** / n(i)hor-/: پاشەوشە. ـ نهێر؛ ـ نۆڕ؛ ـ نوار ‹چاڤ‌نهۆر› ☰ انتظار

**نهـۆرم** / n(i)horim/: ناو. نـوغرۆ؛ چۆنیەتی ڕۆچوونی زەمین ☰ فروفتگی زمین

**نهۆم** / n(i)hom/: ناو. نوهۆم؛ نهام؛ تەبەقەی خانوو ☰ اشکوبه؛ طبقه

**نهه** / n(i)he/: ☜ **نوها**

**نهیت** / n(i)hît/: ناو. تاتەبەرد؛ کەڤری لووس و پان ☰ سنگ صاف و پهن

**نهیتەک** / n(i)hîtek/: ئاوەڵناو. زڕتەزەلام؛ گەلحۆ ☰ لندهور

**نهیک** / n(i)hîk/: ناو. ١. نووکە تەشی ٢. نووکی هەر شتێ ☰ ١. نُک دوک ٢. نُک هر چیز

**نهێرد** / n(i)hêrd/: ناو. زەوی بەرداوی؛ زەمینی بەردەلان ☰ زمین سنگلاخ

**• نهێر** / n(i)hêř-/: پاشەوشە. ـ نهۆر؛ ـ نۆڕ؛ ـ نوار ‹چاڤ‌نهێر› ☰ ـ انتظار

**نهێرتن** / n(i)hêřtin/: ☜ **نوارین**

**نهێرتـۆخ** / n(i)hêřtox/: ئاوەڵناو. چاولێکەر؛ تماشاکەر ☰ بیننده

**نهێرتۆک** / n(i)hêřtok/: ئاوەڵناو. چاوێر؛ چاوەدێر ☰ مُراقب

**نهێرین** / n(i)hêřîn/: ☜ **نوارین**

**نهێم** / n(i)hêm/: ناو. ١. تەوژم ٢. قەوەت؛ زۆر ☰ ١. فشار ٢. نیرو

**نهێن** / n(i)hên/: ئاوەڵناو. نادیار ☰ ناپیدا

**نهێنبڕ** / n(i)hênbiř/: ☜ **نەهێتبڕ**

**نهێندڕ** / n(i)hêndiř/: ☜ **نەهێتگر**

**نهێنگر** / n(i)hêngir/: ☜ **نەهێتگر**

**نهێنی**[1] / n(i)hênî/: ناو. سڕ؛ ڕاز ‹سەرەنجام نهێنی دەرکەوت و چی دزرابوو دۆزرایەوە› ☰ راز

**نهێنی**[2]: ئاوەڵناو. نەهێنی؛ پەنامەکی ‹دەردی نهێنی› ☰ نهانی

**نهێنی**[3]: ئاوەڵکار. نەهێنی؛ پەنامەکی ‹نهێنی یەکتریان دەدواند› ☰ نهانی

**نهێو** / n(i)hêw/: ناو. پەلامار؛ شالاو ☰ هجوم؛ یورش

**نی**[1] / nî/: ☜ **نوێ**

⊡ **نی کرن**: نوێ کردن؛ تازە کردنەوە ☰ نو کردن

**نی**[2]: ئامراز. لەم؛ لە ئەم ☰ در این

**نیئون** / nî'un/: ناو. توخمی شیمیایی لە دەستەی گازگەلی نەجیب، بە ژمارەی ئەتومی ١٠ و کێشی ئەتومی ٢٠,١٧، بێ‌ڕەنگ و بۆن، کە بە ڕێژەی کەم لە هەوادا هەیە ☰ نئون

**نیا**[1] / n(i)ya/: ☜ **نیگا**

⊡ **نیا کردن**: تەمەشا/ تواشا کردن ☰ نگاه کردن

**نیا**[2]: جێناو. ئەمە؛ ئەوهە ☰ این

**نیا**[3]: ئامراز. ١. بەم جۆرە ٢. یان؛ ئان ☰ ١. این طور ٢. یا؛ یا اینکه

**ـ نیا**[4]: پاشەوشە. ١. ـ نراو ‹ئاوەنیا› ٢. ـ دانراو ‹سەرنیا؛ پۆلانیا› ٣. ـ داناو؛ ئاسوودە ‹دڵنیا› ☰ ١و٢. ـ نهاده ٣. آسوده

**نیابان** / n(i)yaban/: ناو. چاتمە؛ کێشکچی؛

پێشدار 🇮🇷 چاتمه

**نیاته** / n(i)yate/: ناو. نۆته؛ پاشەکەوت؛ پەزمەندە 🇮🇷 پس‌انداز

⊡ **نیاته کردن**: نۆتە کردن؛ پاشەکەوت کردن؛ پەزمەندە کردن 🇮🇷 پس‌انداز کردن

**نیاتەکار** / n(i)yatekar/: ناوەڵناو. نۆتەکەر؛ نیاتەکەر؛ پەزمەنەکەر 🇮🇷 اهل پس‌انداز

**نیاتەکەر** / n(i)yateker/: ☜ **نیاتەکار**

**نیادایەنە** / n(i)yadayene/: چاوگ. ۱. چاو لێ کردن؛ تەماشا کردن ۲. سیلەچاو دان؛ خستنە ژێر نەزەر 🇮🇷 ۱. نگاه کردن ۲. زیر نظرگرفتن

**نیار** / n(i)yar/: ناو. ۱. شانۆ؛ سەکۆی گەمەکەران ۲. کۆسە؛ کەسێ لە سەر شانۆ گەمە دەکا 🇮🇷 ۱. سن؛ صحنەی بازی ۲. هنرپیشە

**نیارڤان** / n(i)yarvan/: ناو. کۆسەکار؛ شانۆگەر 🇮🇷 هنرپیشه؛ آرتیست

**نیارڤانی** / n(i)yarvanî/: ناو. نیاری؛ کۆسەکاری؛ شانۆگەری 🇮🇷 هنرپیشگی

**نیاری** / n(i)yarî/: ☜ **نیارڤانی**

**نیاز** / n(i)yaz/: ناو. ۱. پێداویستی؛ ئاتاجی ‹بێ‌ئەوە نیازت بە وشە و لێو و دەنگ هەبێ، بە لێدانی دڵ پێی ئەڵێی خۆشم ئەوێی «سوارە»› ۲. مانا؛ مەبەست ‹نیازت لەم قسە چی بو؟› ۳. ئاوات؛ ئارەزوو ‹هەموو ئەو نیاز و ئاواتەی لە ناو ناخی دەروونا بوو/ لەداخی بێ‌بەڵێنی ئەو، بە جارێ تەفروتوونا بوو «هەردی»› ٤. نەزر؛ نزر؛ نەد ‹نیازم لە خۆم گرتووە، سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بم› ٥. قەست؛ ڕەوتی لە دڵەوە لێ‌بڕان بۆ کردنی کارێک ‹نیازم وایە خانوو دروست کەم› 🇮🇷 ۱. احتیاج ۲. منظور ۳. آرزو ۴. نذر ۵. نیت

⊡ **بەنیاز بون**: گەرەک بوون؛ لێ بڕان ‹بەنیازم وەختێ چووم/ لەگەڵ خۆم/ ڕۆژنامەی ڕەشەبای خوێناوی دووسەدەی کێوانی بۆ بەرم «شێرکۆ»› 🇮🇷 تصمیم داشتن

**نیازانی** / n(i)yazanî/: ناو. دڵپاکی؛ بێ‌فێڵی 🇮🇷 راستی؛ پاکی

**نیازگا** / n(i)yazga/: ناوەڵناو. شوێنی پاڕانەوە و داواکاری 🇮🇷 معبد؛ زیارتگاه

**نیاژێ** / n(i)yajê/: ناو. مامۆژن؛ مەمۆژن؛ ئامۆژن؛ ژن‌ئاپ 🇮🇷 زن‌عمو

**نیاک** / n(i)yak/: ناو. ڕەوتی نەهاتن 🇮🇷 فرایند نیامدن

**نیان**[۱] / n(i)yan/: چاوگ. ۱. دانان؛ دانیان ‹نیانە بان› ۲. داشتن؛ ئاودێری کردن ‹مەزراکە ئاتاجی ئاو لێ نیانە› ۳. نواڕین؛ ڕوانین ٤. چاندن؛ چەقاندن ‹دار نیان› ٥. ناشتن ‹لە قەور نیان› ٦. بارین (بەفر) ‹مترێکی نیا› 🇮🇷 ۱. نهادن ۲. آبیاری کردن ۳. نگاه کردن ۴. غرس کردن ۵. دفن کردن ۶. باریدن (برف)

**نیان**[۲]: ناوەڵناو. ئارام؛ هێمن؛ لەسەرخۆ ‹کابرایەکی نەرم و نیانە› 🇮🇷 آرام

**نیان**[۳]: جێناو. ئەمانە 🇮🇷 اینها

**نیان**[٤]: ئامراز. یان؛ یا 🇮🇷 یا

**نیاندن** / n(i)yandin/: چاوگ. [شوورەیی] سەرجێیی کردن 🇮🇷 جماع کردن

**نیانەوە** / n(i)yanewe/: ☜ **نانەوە**

**نیانێ** / n(i)yanê/: ناوەڵکار. ئا بەم جۆرە 🇮🇷 این طور

**نیاوەزیان** / n(i)yawezyan/: چاوگ. سەر دەرنەچوون؛ لە کار نەزانین 🇮🇷 ناشی بودن

**نیای** / n(i)yay/: چاوگ. نان؛ نیان ‹بنیان وە سەرم کۆنە کەمانێ/ ئەو جە قامەتم دارۆ نیشانێ «بێسارانی»› 🇮🇷 نهادن

**نیایرە** / n(i)yayre/: چاوگ. دانان؛ دانیان 🇮🇷 نهادن

**نیاییش** / n(i)yayîş/: چاوگ. دانانە سەر زەوی 🇮🇷

بر زمین نهادن

**نیبڕ** / nîbiř/: ناو. کاری بۆره کێڵان ☰ عمل شخم زدن زمین بایر

**نیپتونیوم** / nîptunyum/: ناو. تـوخمی کیمیـایی کانزایی ڕادیۆئەکتیڤ لە دەستەی ئاکتینیدەکان، بە ژمارەی ئەتومی ۹۳ و کێشی ئەتومی ۲۳۷,۰٤ و ڕەنگی زێوی بریقەدارەوە کە بە دەسـکرد و لـە ڕەوتی بەرهەم هێنانی پلۆتۆنیومدا بەرهەم دێـت ☰ نپتونیُم

**نیترۆژن** / nîtrojin/: نـاو. تــوخمێکی کیمیــایی ناکانزا، بە ژمارەی ئەتومی ۷ و کێشی ئەتومی ١٤، گـازێکی بـێ‌ڕەنـگ و بـێ‌تـام و بۆنــە کــە ۷۵٪ بارستایی هەوا پێک‌دێنێ ☰ نیتروژن

**نیتک** / nîtik/: ☜ نیتکە

**نیتکە** / nîtke/: نـاو. نیتــک؛ نیرتکــە؛ لەقـــەمی سووکایەتی ‹ناو و نیتکە› ☰ لقب زشت

**نیجا** / nîca/: ئاوەڵکار. لە ئەم جێگە ☰ در اینجا

**نیچک** / nîçik/: نـاو. ١. کوتــەزەڵ؛ پارچەیـــەکی کــورت لـــە قـــامیش ٢. میتکـــە؛ بەلۆکـــە ٣. سەرنوچک؛ دوند ٤. چەکەرەی گیای تازە ڕسکاو ☰ ١. قطعـەی کوچـک نـی ٢. چوچولـه ٣. نُـک ۴. جوانەی گیاه نورس

**نیخ** / nîx/: ناو. بنی گەروو؛ بنی قوڕگ ☰ بیخ گلو

**نیخاندن** / nîxandin/: چاوگ. تێپەڕ. //نیخانـدت؛ دەنیخێنی؛ بنیخێنە// نکاندن؛ نقاندن ☰ زخیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەنیخاندن

**نیخچک** / nîxçik/: ناو. مێخەکە؛ بزمارە ☰ میخچه

**نیخن** / nîxin/: ئاوەڵناو. هەمیشە هەناسەسوار و بـە نیخەنیخی سینگەوە ☰ نفس‌تنگ و دارای خـس ـ خس سینه

**نیخە** / nîxe/: ناو. نێخە؛ حینە؛ حیلەی ئەسـپ ☰ شیهه‌ی اسب

**نیخەنیخ** / nîxenîx/: دەنگەناو. سیخەسیخ؛ دەنگـی سینگ ☰ صدای خس ـ خس سینه

**نیر** / nîr/: نـاو. ١. نوور؛ ڕۆشنایی ٢. دەم؛ کات ٣. نـــیرە؛ نێڵـــە؛ دارێ کـــە دەخرێتـــە ســـەر ملـــی گاجووتان لـە کـاتی زەوی کێڵانـدا ☰ ١. نـور ٢. هنگام ٣. یوغ

**نیرانی** / nîranî/: ئاوەڵناو. بـە هـەردا درێژکـراو ☰ درازکشیده

**نیرتکە** / nîrt(i)ke/: ☜ نیتکە

**نیرز**[۱] / nîriz/: ناو. جۆرێ تیخی خەنجەر ☰ نوعی تیغ خنجر

**نیرز**[۲]: ئاوەڵناو. زۆر باش (ئاژەڵ) ☰ بسیار خوب (دام)

**نیرڤانا** / nîrvana/: ☜ نیروانا

**نیرگ** / nîrig/: ئاوەڵـناو. خـورت؛ بەتاقـەت؛ هێـز و قەوەت‌دار ☰ توانمند

**نیرگوتک** / nîrgutik/: نـاو. مێکوتە؛ نەخۆشـییەکی زارۆکانە زیپکە دەردەکەن ☰ مخملک

**نیرگە** / nîrge/: ناو. دیرەگ؛ کاریتە ☰ بالار؛ شاەتیر

**نیرگەل** / nîrgel/: ناو. ڕیزی ئالوودار؛ ئەو دارانـەی لە سەر نیرگەوە درێژ کراون ☰ ردیف الوار سقف

**نیروانا** / nîrwana/: نـاو. نیرڤـانا؛ ڕۆژی پەسـلان؛ ڕۆژ مەحشەر ☰ روز حشر

**نیرە** / nîre/: ناو. ١. نیری سەر ملـی گـاجووت ٢. نەورە؛ داروو؛ دەرمان حەمام ٣. ئالاش؛ چڵ‌وچێو و گەڵای سەر دارەڕا ٤. جۆگەی ئاو ☰ ١. یـوغ ٢. واجبی ٣. سقف پوش از ترکه و برگ ۴. جوی آب

**نیڕ** / nîř/: ☜ نیڕە

**نیڕگە** / nîřge/: نـاو. گڕی بڵندی ئـاگر ☰ شـعلەی بلند آتش

**نیڕۆ** / nîřo/: ☜ نیوەڕۆ

**نیڕۆی** / nîřoy/: ناو. ئاگادار و چـاوەدێری کۆمـەڵ ☰ سرپرست گروه

**نیڕە** / nîře/: دەنگەناو. نیڕ؛ زیقەی پشـیلە ☰ جیـغ گربه

**نیزام** / nîzam/: نـاو. ۱. ئەرتـەش؛ سـەرجەمی سپای وڵاتێک ۲. سەرباز ☰ ۱. نظام ۲. سرباز

**نیزامی** / nîzamî/: ناو. ئەرتەشی؛ سـپایی؛ کەسـێ کە لە هێزی چەکداری کار دەکا ☰ نظامی

**نیزاموەزیفە** / nîzamwezîfe/: نـاو. ۱. خزمـەتی سەربازی ۲. مەزرینگەی کـۆ کردنـەوە و نـاردنی لاوان بۆ سەربازی ☰ ۱و۲. نظام وظیفه

**نیزرێ** / nîzirê/: ☜ **نزگەرە**

**نیزک** / nîzik/: ☜ **نزیك**

**نیزنەز** / nîznez/: دەنگەناو. نووزەنووز ☰ نالـەهـای ضعیف

**نیزە** / nîze/: ناو. نووزە؛ دەنگی گریانی لەسـەرخۆ ☰ مویه

**نیزیک** / nîzîk/: ☜ **نزیك**

**نیس** / nîs/: ئاوەڵناو. مووتێکەڵاو لـە چەنـد ڕەنـگ (بزن) ☰ با موهای چند رنگ (بز)

**نیسان** / nîsan/: نـاو. ۱. مـانگی چـوارەمی سـاڵی هەتاوی هەندێ لە وڵاتـە عارەبـەکان، ڕێکـەوتی مانگی ئاڤـریلی ئـەورووپی ۲. مـانگی حەوتـەمی ساڵی مەسیحی و مانگی یەکەمی ساڵی جوولەکە ۳. گوڵەمێلاقە؛ ڕەبەنۆک ☰ ۱و۲. نیسان ۳. شقایق

**نیسانۆک** / nîsanok/: نـاو. گوڵـێکی سـوورە لـە مانگی نیساندا دەپشکوێ ☰ گلی سرخ رنگ

**نیست** / nîst/: ناو. نیس؛ چۆنیەتی نەبوون ☰ نیست

**نیستەی** / nîstey/: چاوگ. نووسـین؛ نڤیسـین ☰ نوشتن

**نیسک**[1] / nîsk/: ناو. نـژی؛ نـوژوی؛ نـوژی؛ نسـک؛ نێسک؛ نیسکە؛ نژوو؛ نـووژی؛ نـوژووی؛ نـووپژی؛ مژوی؛ مێژوی؛ مێژوێ؛ مژوی؛ مـەرژی؛ مـارژی؛ مەرجوو؛ مارجوو؛ مـەرجی؛ میشـەوش؛ ڕۆژیـک؛ وانج: ۱. ڕوەکێک لە بنەماڵەی نـۆک و باقلـە بـە گەڵای درێژ و کولکن و بەری خڕیلانەی لووسەوە ۲. تووی ئـەو ڕوەکـە کـە دەنکێکـی خڕیلانـەی لووسـە و دانەوێڵـەیەکی خۆراکییـە ۳. *[مـەجاز]* شتێکی کەمووسکە؛ کەم و ناقابیل ☰ ۱و۲. عدس ۳. چیز کم و ناقابل

**نیسک**[2]: ئاوەڵناو. *[کینایە]* هەلپەرەست؛ خۆڕێکخـەر؛ بە هەموو بارێکدا هاوساز ☰ فُرصت‌طلب

**نیسک**[3]: دەنگەناو. ناسکەی تاژی ☰ صـدای تملـق و شادی تازی

**نیسکاو** / nîskaw/: ☜ **نیسکێن**

**نیسکە** / nîske/: ☜ **مشراق ـ۱**

**نیسکەشۆر** / nîskeşor/: ☜ **نیسکەوشۆر**

**نیسکەنیسک** / nîskenîsk/: دەنگـەناو. نـووزەی سەبری تاژی لە خۆشیان ‹تـاژی نیسکەنیسـکیانە› ☰ صدای آهستەی تازی از شادی

**نیسـکەوشـۆر** / nîskewşor/: نـاو. نیسکەشـۆر؛ بەردەشۆر؛ ڕێخشۆر؛ کاری شوتنەوەی دەغـڵ بـۆ بەرد لێ‌جیا کردنەوە ☰ شستشوی غلّـه بـرای جـدا کردن سنگریزه از آن

**نیسکین** / nîskîn/: ☜ **نیسکێن**

**نیسکێک** / nîskêk/: ئاوەڵکار. هندکـەک؛ کـەمێک؛ تۆزێک ☰ اندکی

**نیسکێن** / nîskên/: ناو. نسـکین؛ نوژیـاو؛ نیسـکاو؛ نیسکین؛ نیسکێنە؛ چێشتی نژی ☰ آش عدس

**نیسکێنە** / nîskêne/: ☜ **نیسکێن**

**نیسە** / nîse/: ناو. نووسراو ☰ نوشته

**نیسەتە** / nîsete/: چاوگ. نووسـین؛ نڤیسـین ☰ نوشتن

**نیسێ** / nîsê/: نـاو. سا؛ سایە؛ سێبە؛ سـێبەر؛ سـێهـ؛ نسـێ؛ نسار؛ سەهەند؛ سەهەن؛ شوێنی تاونەگر ‹لە هـیچ لا خشـپەیەک نایـە، چـرای ماڵـێکی نایێسـێ/ بـە ئەسپایی لە ماڵ دێمە دەرێ، دەخوشێم وەکوو نیسێ «هێمن»› ☰ سایە

**نیشا** / nîşa/: ناو. ۱. نیشـان؛ نیشـانە؛ درۆشـم ۲. خاڵی سەر گۆنـا ۳. نیشـانەی زاوا بـۆ بـووک ٤.

ئامانج؛ نیشانه 🇮🇷 ۱. نشان ۲. خال روی گونه ۳. هدیەی داماد به عروس ۴. هدف؛ آماج

◘ **نیشا دان:** ☜ **نیشان دان**

**نیشاسته** / nîşaste/: ☜ **نشاسته**

**نیشاسه** / nîşase/: ☜ **نشاسته**

**نیشان** / nîşan/: ناو. ۱. نیشانه؛ درۆشم؛ عەلامەت ۲. ئامانج؛ کێلک ۳. نیشانە؛ خاڵ ٤. میداڵ ٥. ناونیشان ٦. پۆپەی کەڵەشێر ۷. جوققەی سەر کلاو و شانی دەسەڵاتداران ۸. پێشکەشی زاوا بۆ بووک پاش مارە بڕان 🇮🇷 ۱. نشان ۲. آماج ۳. خال ۴. مدال؛ نشان ۵. نشانی ۶. تاج خروس ۷. جُقەی امیران ۸. هدیەی داماد به عروس پس از عقدکنان

◘ **نیشان دان:** نیشا دان: ۱. شاندان ۲. فێر کردن 🇮🇷 ۱. نشان دادن ۲. یاد دادن

**نیشان کردن:** ۱. درۆشم بۆ دانان ۲. خوازبێنی کردن و پێشەکی زەنبەرێک بە کیژ دان 🇮🇷 ۱. علامت گذاشتن ۲. هدیه به دختر خواستگاری شده دادن

**نیشان گرتن:** سێرە گرتن 🇮🇷 نشانه گرفتن

**نیشانچی** / nîşançî/: ئاوەڵناو. دەسڕاست لە ئاویتندا 🇮🇷 هدفزن؛ ماهر در تیراندازی

**نیشاندار** / nîşandar/: ئاوەڵناو. خاڵدار 🇮🇷 خالدار

**نیشاندن** / nîşandin/: چاوگ. تێپەڕ. //نیشاندت؛ دەنیشێنی؛ بنیشێنە// نیشتاندن؛ دانیشاندن 🇮🇷 نشاندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەنیشاندن

**نیشاندەر** / nîşander/: ناو. پیشاندەر؛ شاندەر 🇮🇷 نشان دهنده

**نیشانک** / nîşanik/: ناو. ۱. تێبینی؛ بابەتێ کە لە بڕیار یا داوەرییەکدا گرینگە ۲. هێما؛ ئاشیرەت 🇮🇷 ۱. مُلاحظه ۲. اشاره

**نیشانکرد** / nîşankird/: ☜ **نیشانکردوو**

**نیشانکردوو** / nîşankirdû/: ئاوەڵناو. نیشانکرد: ۱. درۆشملێدراو ۲. خوازبێنیکراو (کچ) 🇮🇷 ۱. علامت‌گذاری شده ۲. نشان کرده (دختر)

**نیشانگه** / nîşange/: ناو. ۱. پیشانگە؛ جێگەی ڕانانی شت لە بەر چاو ۲. سێرەی تفەنگ و دەمانچە 🇮🇷 ۱. نمایشگاه ۲. مگسک اسلحه

**نیشان و ناو** / nîşan û naw/: ☜ **ناونیشان**

**نیشانه** / nîşane/: ☜ **نیشان ۱و۳**

**نیشانەئەنگێو** / nîşane'engĕw/: ناو. سەگوان؛ سەگڤان؛ تیرهاوێژی زانا و زەبردەست 🇮🇷 تیرانداز ماهر

**نیشانەک** / nîşanek/: ناو. بەردی داکراو بۆ ئامانج 🇮🇷 سنگ نشانده شده برای نشانه‌گیری

**نیشانی** / nîşanî/: ناو. ناونیشان: ۱. ئادرەس؛ ئەو زانیارییانەی هەواڵ لە جێوشوێنی کەس یان شتێک دەدا «نیشانی خۆتان لە سەر پاکەتەکە بنووسن!» ۲. ئەو زانیارییانەی کەس یان شتێک دەناسێنن «کاتێ نیشانیم دا ناسیمیەوە» 🇮🇷 ۱. آدرس ۲. مُشخصات

**نیشتاندن** / nîştandin/: ☜ **نیشاندن**

**نیشتاو** / nîştaw/: ناو. کشانەوەی ئاوی دەریا 🇮🇷 جزر دریا

**نیشتگ** / nîştig/: ☜ **نیشتوو**[۲]

**نیشتمان** / nîşt(i)man/: ناو. نشتمان: ۱. ژێگە؛ زێد؛ مەوتەن ۲. دیمەن «ئەم سەرگردە نیشتمانی خۆشە» ۳. جێگەی دانیشتن ٤. سەرتەنوور؛ ژووری نان کردن 🇮🇷 ۱. وطن؛ میهن ۲. منظره ۳. جای نشستن ۴. اطاق نان پُختن

**نیشتمانپەرستی** / nîşt(i)manperistî/: ناو. وڵاتپارێزی 🇮🇷 میهن‌پرستی

**نیشتمانفرۆش** / nîşt(i)manf(i)roş/: ئاوەڵناو. *[پلار]* بێگانەپەرست؛ جاش 🇮🇷 وطن‌فروش

**نیشتمانەتی** / nîşt(i)manetî/: ناو. نەتەوایەتی؛ قەومایەتی 🇮🇷 ملیّتی

**نیشتمانی** / nîşt(i)manî/: ☜ **نەتەوەیی**

**نیشتمان پەرست** / nîşt(i)manperist/: ئاوەڵناو. وڵاتپارێز؛ زێدپەرست؛ وڵاتپەرست›. هەروەها: **نیشتمانپەرستی** ☰ وطن‌پرست؛ میهن‌پرست

**نیشتمان پەروەر** / nîşt(i)manperwer/: ئاوەڵناو. خزمەتکاری زێد ☰ میهن‌دوست

**نیشتمەن** / nîşt(i)men/: ئاوەڵناو. لەبار بۆ لێ ژیان ☰ شایان سکونت

**نیشتن** / nîştin/: چاوگ. تێنەپەڕ. //نیشتی؛ دەنیشی؛ بنیشە// ١. دانیشتن؛ ڕۆنیشتن؛ قوون دانەوە ‹لای دەسمەوە نیشت› ٢. تڵتە بن کەوتن ‹داینە با بنیشێ› ٣. کەم بوونەوەی ئاستی شتێک (وەک: ئاوی زۆر) ‹ئاوی بەنداوەکە نیشتووە› ٤. هەڵنیشتن؛ چوونە لانەوە (باڵندە و مریشکان) ‹بۆچە ئەونە زوو ئەخەفن؟ هێشتا مامر نەنیشتگە› ٥. ئاوا بوونی تاو ‹خۆر نیشت› ٦. [کینایە] ڕیان ‹لەسەر ڕێگاکە نیشتووە!› ٧. ڕووبەرێک داپۆشان ‹بەفر نیشت› ٨. بە کارێکەوە پەرژان ‹نیشتە پای، تا تەواوی نەکرد، دەستی لێ هەڵنەگرت› ٩. خۆش هاتن؛ بەرپەسن بوون ‹دەنگی بە دڵەوە ئەنیشێ› ١٠. مانەوە لە شوێنێک، بەتایبەت بۆ شەو خەوتن ‹لە ماڵیانا دوو شەو نیشتین› ☰ ١. نشستن ٢. رسوب کردن ٣. فروکش کردن (مانند آب و...) ۴. لانه رفتن پرنده ۵. غروب کردن آفتاب ۶. ریدن ٧. پوشیدن (سطحی را) ٨. نشستن (پای کاری) ٩. نشستن (به دل) ١٠. اقامت کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: نیشتوو/ چاوگی نەرێنی: نەنیشتن

**نیشتنگا** / nîştinga/: ناو. [کینایە] ئاودەست؛ کناراو ☰ مُستراح

**نیشتنەوە** / nîşt(i)newe/: چاوگ. تێنەپەڕ. //نیشتیەوە؛ دەنیشیەوە؛ بنیشەوە// ١. دانەوە؛ لە فڕین وەستان و هاتنە خواری باڵندە و فڕۆکە ‹هەر ئێستا فڕۆکەیەک نیشتەوە› ٢. نزم بوونەوەی پەنەماویی ئەندام ‹هەوای ژێر چاوم نیشتەوە› ٣. کەم بوونەوەی بارستی شتی تراو ‹ئاوی ڕووبارەکە نیشتەوە› ٤. نەمانی تووڕەیی ‹ڕقی نیشتەوە› ☰ ١. فرود آمدن و نشستن پرنده ٢. فرونشستن آماس اندام ٣. فروکش کردن مایع ۴. فروکش کردن خشم

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: نیشتووەوە/ چاوگی نەرێنی: نەنیشتنەوە

⊡ **لە کوڵ نیشتنەوە**: ١. هێندێک سارد بوونەوە ٢. [مەجاز] هێور بوونەوە ☰ ١. کمی سرد شدن ٢. آرام شدن

**نیشتو**[١] / nîştû/: ☜ **نوشتە ـ١**

**نیشتو**[٢]: ئاوەڵناو. نیشتگ: ١. دانیشتوو ٢. لە فڕین وێستان ٣. بنکەوتوو ☰ ١. نشسته ٢. فرودآمده ٣. رسوبکرده

**نیشتەبەر** / nîşteber/: ناو. کارکەنار؛ وەنیشتە؛ خانەنشین ☰ بازنشسته

**نیشتەبەری** / nîşteberî/: ناو. کارکەناری؛ مووچەی هەڵپەسێراوی لە کار ☰ حقوق بازنشستگی

**نیشتەجه** / nîştecih/: ☜ **نیشتەجێ**

**نیشتەجێ** / nîştecê/: ناو. نشتەجێ؛ نیشتەجه؛ جاگرتە؛ دانیشتوو؛ لە شوێنێکدا سەقام گرتوو ☰ مُقیم؛ ساکن

**نیشتەجێیی** / nîştecěyî/: ناو. ئاکنجێتی ☰ اقامت

**نیشتەنی** / nîştenî/: ئاوەڵناو. لەبار بۆ لێ دانیشتن ☰ نشستنی

**نیشتەی** / nîştey/: چاوگ. دانیشتن ☰ نشستن

**نیشتەیرە** / nîşteyre/: چاوگ. دانیشتن ☰ نشستن

**نیشخۆ** / nîşxo/: ☜ **نەزخۆ**

**نیشدار** / nîşdar/: ☜ **نەشتەرگەر**

**نیشگە** / nîşge/: ناو. ١. لێژی لووس ٢. جێ نیشتنەوەی باڵداران ☰ ١. سراشیبی صاف ٢. جای فرود پرندگان

**نیشه** / nîşe/: ناو. ۱. یاداشت؛ بیرەوەری نووسراو ۲. نمرە بۆ شاگرد ۳. چەشن؛ وێنە ٤. کەیف؛ خوەشی؛ نەشە ☰ ۱. یادداشت ۲. نمرەی مُحصل ۳. مثل؛ مانند ۴. شادی

▣ **نیشە گرتن**: ۱. یاداشت نووسین ۲. نمرە وەرگرتن ۳. خۆشحاڵ بوون؛ سەرکەیف هاتن ☰ ۱. یادداشت نوشتن ۲. نمره گرفتن ۳. خوشحال شدن

**نیعاو** / nî'aw/: دەنگەناو. دەنگی زیلی پشیلە ☰ صدای زیر گربه

**نیعمەت** / nî'met/: ناو. ۱. پیت؛ خەلاتی خوا ۲. خۆشی لە ژیاندا ☰ ۱. نعمت ۲. کامرانی

**نیفاق** / nîfaq/: ناو. دووڕوویی؛ دژیەکی ‹ڕۆم و جوو چاکە ئیتتیفاقی هەیە/ کوردە بێ غیرەتی و نیفاقی هەیە «حاجی قادر»› ☰ نفاق

**نیفەک** / nîfek/: ☜ **نافەك**

**نیڤ** / nîv/: ناو. ۱. لە دوو بەش بەشێک ۲. ناوەند؛ ناوەڕاست ☰ ۱. نیم ۲. وسط؛ میانه

▣ **نیڤا شەوێ**: ناوەڕاستی شەو ☰ نیمەی شب

**نیڤار** / nîvar/: ناو. ۱. نۆژەن؛ تازەهاتوو ۲. باوی دەم و زەمان ☰ ۱. نوظهور ۲. مُد روز

**نیڤبراشتی** / nîvb(i)raştî/: ☜ **نیوەبرژاو**

**نیڤبژیا** / nîvbijya/: ئاوەڵناو. نیمەکولاو؛ هێشتا کاڵ ☰ نیم‌پخته

**نیڤچە** / nîvçe/: ئاوەڵناو. نیمچە؛ ناتەواو ☰ ناتمام

**نیڤدین** / nîvdîn/: ئاوەڵناو. نیوەشێت؛ شێتۆکە ☰ خُل

**نیڤرۆ** / nîvro/: ☜ **نیوەڕۆ**

**نیڤشک** / nîvşik/: ☜ **نویشك**

**نیڤک** / nîvik/: ☜ **نێوك ـ۱**

**نیڤکەو** / nîvkew/: ناو. پۆڕ؛ دوڕاجە؛ مەلێکی لە کەو زلترە ☰ دُرّاج

**نیڤگۆڤەند** / nîvgovend/: ناو. نیوە جەغز ☰ نیم‌دایره

**نیڤگۆن** / nîvgon/: ☜ **نوێن[1]ـ۲**

**نیڤنجی** / nîvincî/: ئاوەڵناو. ۱. نە کورت نە درێژ ۲. نە پیر نە جوان ۳. ناوەڕاست ☰ ۱. متوسط در طول ۲. میانسال ۳. میانه

**نیڤ ـ نیڤ** / nîv nîv/: ئاوەڵکار. نیمە ـ نیمە؛ لە دوو بەش بەشێک؛ لە سەتا پەنجا ☰ نصف به نصف

**نیڤۆ** / nîvo/: ناو. پزوو؛ پزگ؛ نافەک ☰ نیفه

**نیڤە** / nîve/: ناو. نیوە؛ نیمە ☰ نیمه

▣ **نیڤە کرن**: کردنە دوو بەشەوە ☰ نصف کردن

**نیڤەبراشتی** / nîveb(i)raştî/: ☜ **نیوەبرژاو**

**نیڤەچڵ** / nîveçił/: ☜ **نیوەچڵ**

**نیڤەشەو** / nîveşew/: ☜ **نیوەشەو**

**نیڤەک** / nîvek/: ☜ **نیوەك**

**نیڤەکا** / nîveka/: ☜ **نیوەك**

**نیڤەکار** / nîvekar/: ☜ **نیوەکار**

**نیڤەمێر** / nîvemêr/: ئاوەڵناو. /کیایە/ سەڵت؛ هێشتا ژن نەهێناو (لاو) کە ☰ مُجرد (مرد جوان)

**نیڤی** / nîvî/: ناو. ۱. بەشێ لە دوو بەش ۲. ناوەڕاستی ۳. دەستە؛ ناونجی ☰ ۱. نصفه ۲. وسطی ۳. میانی

**نیقاب** / nîqab/: ناو. ڕووپۆش ☰ نقاب

**نیقریس** / nîqrîs/: ناو. جۆرێک نەخۆشی سووت و سازی لەشە کە ڕێژەی ئەسید ئووریکی خوێن بەرز دەبێتەوە و جومگەکان بە هۆی نیشتنی ئەسید ئووریکەوە تووشی هەو و ژان دەبن ☰ نقرس

**نیک** / nîk/: ناو. ۱. دارێ کە بەرداشی پێ بەرز و نزم دەکرێتەوە ۲. نووکە؛ نکە؛ شینی بە شێنەیی ۳. نووک؛ سەری تیژی هەر شتێ ☰ ۱. اهرمی که سنگ آسیا را بالا و پایین می‌برد ۲. مویه ۳. نُک

**نیکاح** / nîkaĥ/: ناو. نکا؛ نەکەهـ؛ ژن و مێردایەتی؛

ژن و شوویی؛ پەیمانێک کە بە پێی ئەوە ژن و پیاوێک دەبنە ژن و مێرد و بنەماڵەیەک دروست دەکەن ☰ نکاح

**نیکال** / nîkal/: ناو. سووچ؛ گۆشە ☰ گوشه

**نیکل** / nîkil/: ناو. ١. ☜ **نکل** ٢. نیکڵ؛ توخمی کیمیایی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ٢٨ و کێشی ئەتومی ٥٨,٩٦، بە ڕەنگی سپی مەیلەو زیو کە چەکوچخۆرە، لە ئاودا ناتوێتەوە و بۆ کاتالیزۆر و پۆشەنی گالوانیزەی کانزاکانیتر و لێدانی دراو و میدال و کەرەستەی نەشتەرگەری و ددانبژیشکی کەلکی لێ وەردەگرن ☰ ١. ☜ **نکل** ٢. نیکل

**نیکڵ** / nîkił/: ☜ **نیکل ـ٢**

**نیکمسمار** / nîkmismar/: ناو. نووکەتەشی ☰ میخ نیم‌حلقەی سر دوک

**نیکۆتین** / nîkotîn/: ناو. ژارقەندە؛ ژارقەنگە؛ ژارقەننە؛ ئالکالوئیدی نێو گەڵای تووتن، کە ڕۆنێکی بێڕەنگە و لە بەر هەوادا زەرد دەبێ و نەختە نەختە بۆر دادەگەڕێ، تامی تیژە و لە ئاو و ئەلکول و ڕۆندا دەتوێتەوە ☰ نیکوتین

**نیکەنک** / nîkenik/: ☜ **نیکەنیک**

**نیکەنیک** / nîkenîk/: دەنگناو. نیکەنک؛ نیکنەک؛ نووکەنووک ☰ نکانک

**نیکنەک** / nîknek/: ☜ **نیکەنیک**

**نیگا** / nîga/: ناو. نیا؛ تواشا ‹نیگام تینووی تەماشاتە/ دادووراوی سەر ڕێگاتە «گۆران»› ☰ نگاه

**نیگابان** / nîgaban/: ئاوەڵناو. سایەدە؛ ئاگادار ☰ نگهبان

**نیگابانی** / nîgabanî/: ناو. پاسەوانی ☰ نگهبانی

**نیگاتیڤ** / nîgatîv/: ناو. فیلم؛ وێنەی سەر فیلم و کاغەز کە ڕوونی و ڕەشاییەکانی پێچەوانەیە ☰ نگاتیو

**نیگادار** / nîgadar/: ناو. نگادار؛ ئاگادار؛ پارێزەر ‹خوا نیگادارت بێ› ☰ نگهدار

**نیگاداری** / nîgadarî/: ناو. ١. کار و ڕەوتی ڕاگرتن؛ هەڵگرتن ٢. چاوەدێری؛ ئاگاداری ☰ ١و٢. نگهداری

**نیگار** / nîgar/: ناو. نگار: ١. نەخش؛ وێنە ٢. *[ئەدەبی]* دڵبەر ‹بەستەیی زوڵفی نیگارێکم ڕەسەن بازی دەکا/ سەففی موژگانی لە تابووری سوپای غازی دەکا «حاجی قادر»› ☰ ١. تصویر ٢. نگار

**نیگارخانە** / nîgarxane/: ناو. جێگەی ڕانانی شکلان ☰ نگارخانه

**نیگارڤان** / nîgarvan/: ☜ **نەققاش ـ١**

**نیگارکێش** / nîgarkêş/: ناو. نەقاش ☰ نقاش

**نیگارکێشی** / nîgarkěşî/: ☜ **نەققاشی ـ٢**

**نیگارە** / nîgare/: ناو. شکلی بە قەڵەم کێشراو ☰ نگاره

**نیگاوانی** / nîgawanî/: ناو. پارێزکاری؛ چاودێری ☰ نگهبانی

**نیگەران** / nîgeran/: ئاوەڵناو. پەرۆش؛ دڵ‌پەرێشان؛ ناڕەحەت ‹هاتن بردیان، زۆر نیگەرانم› ☰ نگران

**نیگەرانی** / nîgeranî/: ناو. دڵ لەدوایی؛ دۆخی دلەودوا بوون ☰ نگرانی

⊡ **کەوتنە نیگەرانی**: پەشێوان؛ تێکچوون ‹کەوتمە نیگەرانی، دەبێ باوکم چی بە سەر هاتبێ «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ نگران شدن

**نیل** / nîl/: ناو. ١. نیری سەرملی گا لە جووتدا ٢. خم؛ چویت؛ دەرمانێکی شینی تاریکە لە گیایەک دەگیرێ بۆ ڕەنگ کردن ☰ ١. یوغ ٢. نیل

**نیلوپەڕ** / nîlûpeř/: ☜ **نیلوفەڕ**

**نیلوفەڕ** / nîlûfeř/: ناو. نیلووپەڕ؛ لیلووپەڕ؛ لوولەپەڕ؛ لوولپەڕ؛ لەیلووپەڕ؛ لیلووفەڕ؛ پەڕپەڕەک؛ پەڕپەڕۆک؛ شەڤبشکێڤ؛ گیایەکی ئاڵفی بە گوڵی زەرد و سپی و لینجاوێکی زۆرەوە کە بۆ دەرمان دەشێ ☰ نیلوفر

**نیله** / nîle/: ناو. نیری ملی گاجووت ☰ یوغ

**نیلی**[١] / nîlî/: ناو. کەوە؛ کـەوگ؛ کـەوێ؛ چـویتی؛ چویتلی؛ هەشی؛ خمی؛ شینتۆخ؛ ڕەنگـی ئـاوی تۆخ کە بۆ بنەوش داگەڕێ ☰ نیلی

**نیلی**[٢]: ئاوەڵناو. خمی؛ چویتی؛ بـە ڕەنگـی خـم ☰ نیلی رنگ

**نیمبرژ** / nîmbirj/: ☜ **نیوەبرژاو**

**نیمبرێژ** / nîmb(i)rêj/: ☜ **نیوەبرژاو**

**نیم**[١] / nîm/: ناو. نیڤ؛ نیو؛ بەشێ لە دوو بـەش ☰ نصف؛ نیم

**نیم ـ**[٢]: پێشوشە. ـ نیو؛ ـ نیمە ‹نیمکوڵ؛ نیمنیگـا› ☰ نیمه ـ

**نیمپز** / nîmpiz/: ☜ **نیمپوخت**

**نیمپوخت** / nîmpuxt/: ئاوەڵـناو. نـیمپـەز؛ نـیمپـز؛ نیوەکوڵ؛ مامناونجی لە کوڵاندا ☰ نیمپُخته

**نیمپەز** / nîmpez/: ☜ **نیمپوخت**

**نیمجەت** / nîmcet/: ئاوەڵـناو. ١. شـڕی پینـەکراو ٢. سـەقەت؛ سـەکەت ☰ ١. پینـەشـدە ٢. ناقص‌العضو

**نیمچە**[١] / nîmçe/: نـاو. جامۆڵە؛ کاسـەی بچـووکی نەختێ لە پیاڵە گەورەتر ☰ نیمکاسه

**نیمچە ـ**[٢]: پێشوشـە. نیمـەـ؛ ناتـەواو ‹نیمچەمـەلا؛ نیمچەدەولەتێکی دامودەزگاییمان نییە «پەشێو»› ☰ نیم ـ

**نیمچەجزیرگە** / nîmçec(i)zîrge/: ☜ **نیودورگە**

**نیمچەدورگە** / nîmçeduřge/: ☜ **نیودورگە**

**نیمدار** / nîmdar/: ئاوەڵناو. نیمداشـت؛ نیوداشـت؛ ناونجی لە کۆنەیی و تازەییدا (زۆرتـر بـۆ بـەرگ و جلوجێوان و ڕایەخ دەگوترێ) ‹داراییم بیەسە چـوار دوێت و یەی کوڕ/ دو پـەتووی نیمـدار، یـەی جـوف لافەشر «شامی»› ☰ نیمدار

**نیمداشت** / nîmdaşt/: ☜ **نیمدار**

**نیمر** / nîmir/: ئاوەڵناو. نزم؛ نەوی؛ نفی ☰ پست

**نیمرار** / nîmrar/: نـاو. نیمـڕایر؛ نیـوەی ڕێگـە ☰ نیمه‌ی راه

**نیمڕایر** / nîmřayir/: ☜ **نیمرار**

**نیمـڕۆ** / nîmřo/: نـاو. ١. ☜ **نیـــوەڕۆ** ٢. ☜ **هێلکەوڕۆن**

**نیمڕۆژ** / nîmřoj/: ☜ **نیوەڕۆ**

**نیمڕوو** / nîmřû/: ناو. نیوڕوو؛ هێلکـە و ڕۆن؛ خـا و ڕوون؛ هێلکەی دەڕۆن کراوی تێکـەڵ نـەدراو ☰ نیمرو

**نیمسۆز** / nîmsoz/: نـاو. بسووت؛ چۆڵە؛ چلۆسـک؛ دار و چیلکەی سەر بە ئاگر ☰ نیمسوز

**نیمسەرا** / nîmsera/: نـاو. نـیمسـەرە؛ نیـو سـاڵ؛ شەش مانگ ☰ شش ماه؛ نیم سال

**نیمسەرە** / nîmsere/: ☜ **نیمسەرا**

**نیمقڕ**[١] / nîmqiř/: نـاو. جـۆرێ قومـاش ☰ نـوعی پارچه

**نیمقڕ**[٢]: پیرۆ. ← **قڕونیمقڕ**

**نیمگەز** / nîmgez/: ☜ **نیوگەز**

**نیمناز** / nîmnaz/: ناو. ناز و عیشوە ☰ ناز و عشوه

**نیمنمەک** / nîmn(i)mek/: ئاوەڵناو. نیمەنمەک: ١. خوێکراو؛ نمەک لێدراو؛ خوێ پێوەکراو (خۆراک) بـە مەبەسـتی نمچـنکـردن و بـەرگری لـە سەرهەڵـدان و گەشـەی میکـروب ٢. *[کنـایی]* تلوخـوێ؛ پـڕخوێ؛ زۆر سـوێر ☰ ١. نمکسـود ٢. بسیار شور

**نیمە**[١] / nîme/: ناو. ١. نـیم؛ نـیڤ؛ بەشـێ لـە دوو بەش ٢. خشتی لە ناوەڕاستەوە لەت ٣. ☜ **نوێژ** ☰ ١. نصف ٢. نیمه آجر ٣. ☜ **نوێژ**

▣ **نیمەی شەو**: نیڤاشەوێ؛ درەنگانی شەو ☰ نصف شب

**نیمە ـ**[٢]: ☜ **نیوە ـ**[٣]

**نیمەچڵ** / nîmeçił/: ☜ **نیوەچڵ**

**نیمەچڵی** / nîmeç(i)łî/: ☜ **نیوەچڵی**

**نیمەردەنی** / nîmerdenî/: ناو. هەرماوی؛ نەمری 🇮🇷 جاودانگی

**نیمەرۆ** / nîmero/: ☜ نیوەڕۆ

**نیمەڕوان** / nîmeřwan/: ☜ نیوەڕۆیی

**نیمەڕۆ** / nîmeřo/: ☜ نیوەڕۆ

⊡ **نیمەڕۆ بێژە:** حەز بە زوو دەس‌کێشان لە کار ‹هێشتا دەسمان گەرم نەوگە ئەو نیمەڕۆبێژەیە!› 🇮🇷 اشتیاق به زود تعطیل کردن کار

**نیمەڕۆژە** / nîmeřoje/: ناو. ١. ☜ نیوەڕۆژ ٢. ژەمی نیوەڕۆ لە ئالفی مالات 🇮🇷 ١. ☜ نیوەڕۆژ ٢. جیرەی ظُهر احشام

**نیمەڕوو** / nîmeřû/: ناو. ١. ☜ نیوەڕۆ ٢. ☜ نیوەڕوو

**نیمەڕی** / nîmeřî/: ئاوەڵناو. تۆقیو؛ زۆر ترساو. هەروەها: **نیمەڕێ کردن** 🇮🇷 زهره‌ترک شده

**نیمەڕێ**[1] / nîmeřê/: ناو. بەشێک لە دوو بەشی ڕێگا 🇮🇷 نیمەی راه

**نیمەڕێ**[2]: ئاوەڵناو. هەر تا نیوەی ڕێگا ‹ڕەفیقی نیمەڕێ› 🇮🇷 نیمەراه

**نیمەشەو** / nîmeşew/: ☜ نیوەشەو

**نیمەکارە** / nîmekare/: ☜ نیوەکارە

**نیمەکوڵاو** / nîmekuław/: ئاوەڵناو. نیڤ‌بژیا؛ هێشتا کاڵ 🇮🇷 نیم‌پخته

**نیمەگەرم** / nîmegerim/: ئاوەڵناو. نیوەگەرم؛ شلەتێن؛ شیلەوگەرم 🇮🇷 ولرم

**نیمەگیان** / nîmeg(i)yan/: ☜ نیوەگیان

**نیمەلێوە** / nîmelěwe/: ئاوەڵناو. هاوی؛ گەللایی؛ شێتۆکە 🇮🇷 خُل

**نیمەنمەک** / němen(i)mek/: ☜ نوێ‌نمەک

**نیمەونیم** / nîmewnîm/: ☜ نیوەڕۆ

**نین** / nîn/: ناو. نوون؛ عەیب و کەمایەسی 🇮🇷 نقص؛ عیب

⊡ **نین بون:** نەبوون 🇮🇷 نیست شدن

**نینا** / nîna/: ☜ نینۆ

**نینک** / nînik/: ☜ نینۆک

**نینگون** / nîngûn/: ☜ نەوەژن

**نینۆ** / nîno/: جێناو. نینا؛ ئەمانە؛ یانە 🇮🇷 اینها

**نینۆخ** / nînox/: ☜ نینۆک

**نینۆخگیر** / nînoxgîr/: ☜ نینۆک‌بڕ

**نینۆر** / nînor/: ناو. گندۆڕ؛ دۆریە؛ قەلەندۆر 🇮🇷 گیاهی با ساقه‌ی خوراکی

**نینۆک** / nînok/: ناو. نەنووک؛ نەینۆک؛ نەینووک؛ نەینوک؛ نینک؛ ناخون؛ ناخوو؛ ناخوون؛ نانوخ؛ نانووخ؛ نینۆخ؛ ناخوێن؛ ناخن؛ ناخووین؛ نوخان؛ نۆخان؛ نخان؛ نووخەن؛ نووخان؛ چکر؛ چکیر؛ چقیر؛ چنگیر؛ چنجرۆک؛ ماکێکی ڕەق و بریقەدارە لە پشتی قامکی مرۆڤ و زۆربەی مۆرغەدارانەوە دەردێ 🇮🇷 ناخن

⊡ **نینۆکی خانم:** ڕیش‌بابا؛ جۆرێ ترێی سووری دەنک باریکی درێژۆکە 🇮🇷 انگور ریش‌بابا

**نینۆک‌بڕ** / nînokbiř/: ناو. نەنووک‌بڕ؛ نەنووک‌گر؛ ناخونگر؛ ناخوێنگیر؛ ناخوونگیر؛ نووخان‌بڕ؛ نووخانگیر؛ نینۆخگیر؛ نانۆخگیر؛ چکرگر؛ کەرەسەیێ بۆ قرتاندن و کوڵ کردنەوەی سەری نینۆک 🇮🇷 ناخُنگیر

**نینۆک‌ڕەق** / nînokřeq/: ☜ نینۆک‌وشک

**نینۆکشکێن**[1] / nînokş(i)kên/: ناو. /کینایە/ بەستەڵەکی ئاخر پایز لە زاراوەی ڕاوکەراندا 🇮🇷 یخبندان اواخر پاییز در اصطلاح شکارچیان

**نینۆکشکێن**[2]: ئاوەڵناو. /کینایە/ بەستوو؛ یەخ‌کردوو؛ پۆشراو بە یەخ و بەستەڵەک ‹مەیە بۆ ئەم چیا نینۆکشکێنە/ دزی سیرمە و گەرۆکی گەرمەسێری «هێمن»› 🇮🇷 یخبندان؛ پوشیده از یخ

**نینۆک‌وشک** / nînokwişk/: ئاوەڵناو. /کینایە، پەلار/ نینۆک‌ڕەق؛ ڕژد 🇮🇷 خسیس

**نینۆکەشەیتان** / nînokeşeytan/: ناو. شەیتانۆکە 🇮🇷

حلزون

**نینه** / nîne/: دەنگ. نینی؛ وشەی مریشک داکردن ‹نینه ـ نینه! خانه ژووره› ☰ کلمەی راندن مُرغ به لانه

**نینی**[1] / nînî/: ☜ **نەنك**

**نینی**[2]: ئاوەڵناو. تازەی تازە؛ زۆر تازە ☰ کاملاً تازه

**نینی**[3]: ☜ **نینه**

**نیو**[1] / nîw/: ناو. نیم؛ نیڤ؛ بەشێ لە دوو بەش ☰ نصف

**نیو**[2]: پێشوشە. نیم ـ؛ نیڤ ـ ‹نیونیگا؛ نیوهەنگاو› ☰ نیم ـ

**نیوال** / nîwal/: ناو. دۆڵ؛ دەرە ☰ درّه

**نیوبرژ** / nîwbirj/: ☜ **نیوەبرژاو**

**نیوبرژاو** / nîwbirjaw/: ☜ **نیوەبرژاو**

**نیوبست** / nîwbist/: ناو. باواقۆرەت؛ بابەقوورەت ☰ کوتوله

**نیوبەنیو** / nîwbenîw/: ☜ **نیوەونیو**

**نیوبیوم** / n(i)yubyum/: ناو. توخمی کیمیایی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ٤١ و کێشی ئەتومی ٩٢،٩٠، بە ڕەنگی خۆڵەمێشی بریقەدار کە لە پێکهاتەگەلی خۆڕاگر لە بەرامبەر گەرمادا بە کار دێت ☰ نیوبیُم

**نیوجەغز** / nîwceğz/: ناو. لەتێ لە کۆز ☰ نیمدایره

**نیوداشت** / nîwdaşt/: ☜ **نیمدار**

**نیودورگە** / nîwduřge/: ناو. نیمچەدورگە؛ سادورگە؛ گراڤە؛ نیمچەجزیرگە؛ کەرکە؛ کەرگراف؛ زەوینێک سێ لای ئاو و لایێکی وشکانی ‹نیودورگەی عەرەبستان› ☰ شبەجزیره

**نیورۆ** / nîwro/: ☜ **نیوەڕۆ**

**نیوران** / nîwřan/: ☜ **نیوەڕۆ**

**نیورانێ** / nîwřanê/: ئاوەڵکار. لە دەمی نیمەڕۆدا ☰ هنگام ظُهر

**نیورو** / nîwřû/: ناو. ١. ☜ **نیمرو** ٢. ☜ **نیوەڕۆ**

**نیوقەد** / nîwqed/: ناو. نیوەی لەش بەتایبەت بەشی ژووروو ☰ نیم‌تنه

**نیوکاسە** / nîwkase/: ناو. دەفری بچووک لە چینی ☰ نیم‌کاسه

**نیوگەز** / nîwgez/: ناو. نیمگەز؛ پێوانەیەکی کووتاڵ و شاڵە ☰ نیم‌زرع؛ نیم‌زرعی

**نیوە**[1] / nîwe/: ناو. نیم؛ نیڤ؛ نیڤی؛ نێمە؛ نیمە؛ نسف؛ نسم: ١. هەرکام لە دوو بەشی هاوئەندازە لە شتێک ‹نیوەی هۆزەکەم لێم بوونە دوژمن/ خۆم ئەشارمەوە قوژبن بە قوژبن «موفتی پێنجوێنی»› ٢. ناوەندی ئەندازە و مەودایەک ‹پیالەکە تا نیوە پڕ بوو› ☰ ١. نصف ٢. نیمه

**نیوە**[2]: ئاوەڵناو. نیمە؛ نسم: ١. دوونیو؛ دووکوت؛ بە یەک ئەندازە لەگەڵ ئەو بەشەکەی تر ‹دۆکەی نیوە کرد و نەیهێشت بۆی پێوە کەین› ٢. بە نیوە ئەوەندەوە ‹ئەم کاسە بۆ نیوەیە؟› ٣. نیوەچڵ؛ ناتەواو ‹کارەکەی هەروا نیوە هێشتۆتەوە› ☰ ١تا٣. نصفه

**نیوە**[3]: پێشوشە. نیمە ـ: ١. بە ئەندازەیەکی کەمترەوە ‹نیوەکارە؛ نیوەتیر› ٢. نیمێ لە شتێ یان دۆخێ ‹نیوەئاجۆر؛ نیوەنان› ٣. ناوەڕاست ‹نیوەڕۆ؛ نیوەڕێگا› ☰ ١تا٣. نیمه ـ

**نیوەبرژاو** / nîwebirjaw/: ئاوەڵناو. نیڤبراشتی؛ نیڤەبراشتی؛ نیمبرژ؛ نیمبرێژ؛ نیوبرژ؛ نیوبرژاو؛ تەواو نەبرژاو ☰ نیم‌برشته

**نیوەبەنیوە** / nîwebenîwe/: ☜ **نیوەونیو**

**نیوەپیاو** / nîwep(i)yaw/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* ناتەواو (مرۆ) ☰ ناکامل (انسان)

**نیوەجۆش** / nîweco ş/: ئاوەڵناو. گەمڕ؛ نیوەکوڵ ☰ نیم‌جوش

**نیوەجەغز** / nîweceğz/: ناو. گەوە ☰ نیم‌دایره

**نیوەچڵ**[1] / nîweçił/: ئاوەڵناو. نیڤەچڵ؛ نیمەچڵ؛

ناتــەواو ‹حاشــا لــە کــاری نیــوەچڵ› 🇮🇷 ناتمــام؛ نیمەتمام

**نیوەچڵ**[2]: ئاوەڵـکار. نیڤـەچڵ؛ نیمـەچڵ؛ ناتــەواو ‹نیوەچڵ بەجێم هێشت› 🇮🇷 نصفەنیمە

**نیــوەچڵی** / nîweç(i)łî/: ئاوەڵــناو. نیمەچڵـــــی؛ ناتەواوی ‹کارەکـەمان بـە نیوەچڵـی ماوەتــەوە› 🇮🇷 ناتمام

**نیوەر** / nîwer/: ☜ **نوێنەر**

**نیــوەڕۆ** / nîweřo/: نــاو. نیــڕۆ؛ نیڤــرۆ؛ نیمــڕۆ؛ نیمرۆژ؛ نیمەڕۆ؛ نێوەڕۆ؛ نیمەڕوو؛ نیوڕۆ؛ نیوڕان؛ نیوڕوو؛ نیمەونیم؛ کاتێ کـە تـاو نیـوەی ڕێگای ڕۆژی بڕیوە 🇮🇷 سرِ ظُهر

**نیــوەڕۆژ** / nîweřoj/: نــاو. نیمـــەڕۆژە؛ فـــراوین؛ نیوەڕۆژە؛ نانی نیوەڕۆ؛ نەهار 🇮🇷 ناهار

**نیوەڕۆژە** / nîweřoje/: ☜ **نیوەڕۆژ**

**نیوەڕۆیان** / nîweřoyan/: ☜ **نیوەڕۆیی**

**نیــوەڕۆیـی** / nîweřoyî/: ئاوەڵــکار. نیوڕانـــێ؛ نیمەڕوان؛ نیوەڕۆیان؛ لە کاتی نیوەڕۆدا 🇮🇷 هنگام ظُهر

**نیوەڕوو** / nîweřû/: ناو. نیمەڕوو؛ لایەکی ڕوخسار 🇮🇷 نیمرُخ

**نیوەڕێ** / nîweřê/: ناو. نیڤی ڕێکێ 🇮🇷 نیمەی راه

**نیــوەساز** / nîwesaz/: ئاوەڵـناو. گەلاڵـــە؛ گلاڵــە؛ گولالە؛ نیوەدروست بوو 🇮🇷 نیمساختە

**نیــوەسوێر** / nîwes(i)wêr/: ئاوەڵـناو. تێرخــوێ 🇮🇷 نیمشور

**نیوەسووتاو** / nîwesûtaw/: ناو. چلاسک؛ کۆتەرە؛ چلۆسک؛ بزووت 🇮🇷 نیمسوز

**نیوەسـەڵت** / nîweselt/: ئاوەڵـناو. تایبەتمەنـــدی لاوێ کــــە ژنی مـــــارە کردبـــێ و هێشـــــتا نەیگۆزابێتەوە 🇮🇷 جوان عقدکردەی عروسی نکردە

**نیوەشۆ** / nîweşo/: ناو. نیوەشۆر؛ سوێنکەسـابوون 🇮🇷 تەماندەی صابون

**نیوەشۆر**[1] / nîweşor/: ☜ **نیوەشۆ**

**نیوەشۆر**[2]: ئاوەڵناو. باش نەشۆراو؛ خاس نەشۆریاگ 🇮🇷 نیمشُستە

**نیوەشــەڕ** / nîweşeř/: نـــاو. شـــــەڕەجوێن و چنگەپرچـــە، بـــە بـــێ لێکـــدان ‹... نــەمزانی مارەبڕینیش نیوەشەڕێکە! «هەژار»› 🇮🇷 نزاع لفظی تا حد دست بە یقە شدن

**نیوەشەو** / nîweşew/: ناو. نیڤەشــەو؛ نیمەشــەو؛ نیڤا شەوێ؛ درەنگانی شەو 🇮🇷 نیمەشب

**نیوەشەوی** / nîweşewî/: ناو. قـامێکی کۆنــە لــە چەشنی حەیران و لاوک 🇮🇷 آهنگی قدیمی

**نیوەشـەوێ** / nîweşewê/: ئاوەڵـکار. لــە دەمـــی نیوەشەودا ‹... نیوەشەوێ لە جێژوانێ، چـاوەڕوانی نەشمیلانێ ... «بەیت»› 🇮🇷 نیمەشب

**نیوەشــەی**[1] / nîweşey/: نـــاو. ۱. نەخۆشـــــی؛ لەش‌بەباری ۲. *[کینایە]* زگ‌پڕی 🇮🇷 ۱. بیمـاری ۲. حاملگی

▣ **نیوەشەی عەیەلەی**: *[کینایە]* زکپڕی 🇮🇷 حاملگی

**نیوەشەی**[2]: ئاوەڵناو. دزێو؛ ناپەسـەند؛ ناشـیرین 🇮🇷 ناپسند

**نیــوەشێت** / nîweşêt/: ئاوەڵــناو. دەلووکــار؛ دەلی؛ نیڤدین 🇮🇷 خُل‌مزاج

**نیــوەک** / nîwek/: ئاوەڵــکار. نیڤـــەک؛ نیڤـــەکا؛ نیوەکا: ۱. لە ناوەڕاستدا ۲. لەتێ لـە دوو لـەت 🇮🇷 ۱. در وسط ۲. نیمی

**نیوەکا** / nîweka/: ☜ **نیوەک**

**نیوەکار** / nîwekar/: ناو. نیڤەکار؛ ڕەنجبەرێ کـە بە تۆم و جووتی یەکێ‌تر کار دەکـا و بەشـێ لـە دوو بەشی بەهرەی بەر دەکەوێ 🇮🇷 کشاورزی کە نیمی از محصول را می‌برد

**نیوەکـــارە** / nîwekare/: ئاوەڵــــناو. نیـــــوەچڵ؛ نیمەکارە؛ ناتەواو 🇮🇷 نیمەکارە؛ ناقص

**نیوەکاری** / nîwekarî/: ☜ **نیوەونیو ـ۲**

**نیــوەکــوتر** / nîwekutir/: ئاوەڵــناو. کــــوێرەک؛ چاوپڕووش؛ کەمبین ⊡ کمسو

**نیوەکوتراو** / nîwekutraw/: ئاوەڵناو. میانـدار ⊡ نیمکوب (غلّه)

**نیوەکوڵ** / nîwekuł/: ☜ **نیمپوخت**

**نیوەگا** / nîwega/: ناو. تاکە گایەک لـە دووگـای جووت ‹بە نیوەگایەک ناکێڵـدرێ› ⊡ یـک گـاو از جُفت شخمزن

**نیوەگۆ** / nîwego/: ناو. هـەرکام لـە دوو نیـوەی گۆیەک ‹نیوەگۆی باکووری› ⊡ نیمکُره

**نیوەگەرم** / nîwegerm/: ☜ **نیمەگەرم**

**نیوەگیــان** / nîweg(i)yan/: ئاوەڵــناو. نیمـــەگیان؛ نیوەمردوو: ١. بە بارودۆخێک لـە نێـوان مـان و نەماندا ‹کاتێ کـە دۆزیمانـەوە نیوەگیـان بـوو› ٢. زۆر ناساخ و نەخۆش ‹بۆ لە کۆڵی ئەم پیرەمێـردە نیوەگیانە نابنەوە؟› ⊡ ١و٢. نیمەجان

**نیوەمردوو** / nîwemirdû/: ☜ **نیوەگیان**

**نیوەند** / nîwend/: ☜ **ناوەند**

**نیوەنمــەک** / nîwen(i)mek/: نـــاو. نیمـــەنمک؛ ئاردی بە ئاو شێلدراوی تێرخـوێ کـراوی گـەرم کە لە سەر بـرین و دمـەڵ دادەنـدرێ ⊡ خمیـر نمکمال داغ که بر زخم و دُمل نهند

**نیوەونیـو** / nîwe w nîw/: ئاوەڵکار. نیوەبـەنیوە؛ نیوبەنیو؛ نیمەونیم: ١. بـە شـێوەی دوو نیـوەی وەک یەک ‹پارەی نەوت نیوەونیو بـۆ کۆمپانیاکـان بێـت› ٢. دووکـوتی؛ نیوەکـاری؛ بـە شـێوەی نیوەیەک لە هەرکام لە ئەندامەکان ‹قوتابییەکان نیوەونیو هاتبوونەوە› ⊡ ١و٢. نیمانیم

**نیوەیی** / nîweyî/: ئاوەڵناو. شەریکی نیوە بە نیـوە ⊡ نصف به نصف

**نیۆ** / n(i)yo/: جێناو. ئەمانە؛ نیا؛ نێن ⊡ اینها

**نیەت** / n(i)yet/: ناو. ١. نیـاز؛ قەسـت ٢. *[کینایە]* ڕۆژی سەرەتای ڕەمەزان ‹کەنگێ نیەتـە؟› ⊡ ١. قصد؛ نیت ٢. روز اول ماه رمضان

⊡ **نیەت هێنان/ هاوردن**: بـڕیار دان بـە زمـان بـۆ بەجێ هێنانی کارێکی زیـاتر ئـایینی ⊡ نیـت کردن برای انجام امر یا فرضیه‌ای بیشتر دینی

**نیەر** / n(i)yer/: نـاو. مینبـەر؛ جێگـەی بـەرزی تایبەتی بۆ قسەکەر ⊡ منبر

**نیەون** / niyewin/: نـاو. گوێلپـار؛ نۆگوهـان ⊡ تلیسه

**نیهاد** / nîhad/: ناو. دڵ و دەروون ⊡ نهاد

**نیهاڵ** / nîhal/: ناو. لقـی دار؛ لکـی درەخـت ⊡ شاخەی درخت

**نیهان** / nîhan/: چـاوگ. *[کینایە]* گـان؛ کوتـان؛ سەرجێیی کردن ⊡ جماع کردن

**نیهانی** / nîhanî/: ئاوەڵــناو. ناشـــی؛ تازەکـــار؛ ڕانەهاتوو لە کار ⊡ ناشی

**نیهایەت** / nîhayet/: نـاو. دوومـاهی؛ ئـاخری ⊡ نهایت

**نییی** / nîyî/: جێناو. ١. ئەمە؛ یە ٢. ئەمانـە؛ یانـە ⊡ ١. این ٢. اینها

**نێ**[1] / nê/: ناو. ١. نـا؛ نـە؛ نـاء ٢. نـاوی ئاسـیاو؛ دۆلاش ٣. شـە؛ شـێ؛ نم ٤. نـوون؛ بیسـت و حەوتەمین پیتی ئەلفوبێی زمانی کوردی ⊡ ١. نه ٢. ناو آسیا ٣. نم ۴. نون

⊡ **نێکەرد ـ نێوەرد**: *[مەجاز]* بـێلایـەن؛ نـەکرد و نەخوارد ⊡ بی‌طرف

**نێ**[2]: ئاوەڵناو. مێ؛ مێنگە؛ بەرانبەر بە نێر ⊡ مـادە؛ مؤنث

**نێ**[3]: ئاوەڵکار. نا؛ نە؛ ناء ⊡ نه

**نێ**[4]: جێناو. ١. ئەم؛ ئەمە ٢. ئەمانە؛ ئەم کەسـانە؛ ئەشتانە ⊡ ١. این ٢. اینها

**نێ**[5]: ئامراز. ١. دەنا؛ مەگین نە (زۆرتـر لـە دۆخـی پرسیاردا) ٢. لەمە؛ لەوە؛ ٣. بە هۆی؛ لـە بـەر ⊡ ١. مگر نه ٢. از این ٣. به سبب

**نێ -**[1]: پێشگر. بێ؛ نیشانەی نەفی و لێوەرگرتنی مەعنایەک ‹نێشەرم؛ نێچار› 🇮🇷 بی -

**نێئۆدیمیوم** / nê'udîmyum/: ناو. توخمێکی کیمیایی کانزا لە دەستەی لانتانیدەکان بە ژمارەی ئەتومی ٦٠ و کێشی ئەتومی ١٤٤،٢٤ و ڕەنگی زەردەوە کە لە دروست کردنی جام و شووشەدا بە کار دێت 🇮🇷 نئودیمیُم

**نێبکۆنێبۆڕۆ** / nêbkonêboř̌o/: نزا. جنێوێکە واتا نە کوڕت هەبێ نە پاتاڵ 🇮🇷 دُشنامی است

**نێبۆ.نێبۆ** / nêbo nêbo/: نزا. خوانەکا؛ دەغیلە 🇮🇷 هرگز مباد

**نێبو** / nêbû/: نزا. خوانەکا 🇮🇷 مباد

**نێتار** / nêtar/: ئاوەڵناو. بێلایەنگیری؛ دوورەپەرێز لە کێشە 🇮🇷 بی‌طرف

**نێتاری** / nêtarî/: ناو. دوورەپەرێزی؛ بێلایەنی 🇮🇷 بی‌طرفی

**نێچار** / nêçar/: ناو. بێچارە؛ هەژار و داماو 🇮🇷 بیچاره

**نێچیر** / nêçîr/: ناو. نچیر؛ نەچیر؛ نەچیرگ؛ ڕاو؛ ئەو گیانەوەرەی کە بە کوشتن، زامار کردن یان تەڵە گیراوە ‹نێچیر ناچێ بو لای ڕاوکەر «مەسەل»› 🇮🇷 نخجیر؛ شکار

◻ **نێچیر کردن:** ١. ڕاو کردن ٢. گرتن بە ڕاو 🇮🇷 ١و٢. شکار کردن

**نێچیرڤان** / nêçîrvan/: ناو. نێچیرەوان؛ نچیرڤان؛ نچیروان؛ نەچیروان؛ نەچیرڤان؛ نچیرکار؛ ڕاوچی؛ ڕاویار؛ ڕاوکەر؛ ڕاڤرۆ؛ ڕاڤەڤان؛ ڕاڤکار؛ سەیدەوان؛ سەیڤان؛ سەیاد؛ کەسێ کە گیانەوەران ڕاو دەکا 🇮🇷 شکارچی

**نێچیرگا** / nêçîrga/: ناو. ڕاوگە؛ جێ ڕاو 🇮🇷 شکارگاه

**نێچیرەوان** / nêçîrewan/: ☜ **نێچیرڤان**

**نێخە**[1] / nêxe/: ☜ **نیخە**

**نێخە**[2]: دەنگناو. دەنگی بە مرخەمرخ لە قوڕگەوە 🇮🇷 صدای گلو از نفس‌تنگی یا خفگی

**نێد** / nêd/: ناو. نوخشانە؛ خەوەر لە ڕووداو یان ئاکامی باش 🇮🇷 مُژده

**نێر**[1] / nêr/: ئاوەڵناو. ١. نەر؛ سەر بە ڕەگەزێ کە بالغەکەی دەتوانێ بە لفگری، ڕەگەزی مێوینەی خۆی ئاوس بکا ‹بەرخی نێر بۆ سەر برینە «مەسەل»› ٢. باسکلاوی بە ڕێواس ‹ئەمساڵ ڕێواس نێرە› ٣. *[مەجاز]* ئازا و بەکار ٤. گڕ؛ کلۆفت؛ قەوی 🇮🇷 ١. نر ٢. ریواس ساقه‌دار ٣. شُجاع و کارآمد ۴. کُلُفت

◻ **نێر بوون:** گڕ بوون؛ بۆ دەنگی کوڕی تازەلاوی ئێژن، واتا خەریکە پێدەگا ‹دەنگی نێر بووە› 🇮🇷 بالغ شدن (پسر)

**نێر بوونەوە:** ١. پندر بوونەوەی زەوی کە بە کاری کێڵان بێت ٢. پیر بوون و ناوک دەرکردنی تیرەی چۆنەر و توور و ... 🇮🇷 ١. سفت شدن زمین تر و قابل کشت شدن آن ٢. پیر شدن چغندر و تُرُب و امثال آن‌ها

▪ **-نێر**[2]: پاشەوشە. بنێر ‹پەیامنێر؛ وەڵامنێر› 🇮🇷 ـفرست

**نێرامێ** / nêramê/: ☜ **نێرومێ**

**نێرانە** / nêrane/: ئاوەڵکار. ئازایانە؛ مەردانە ‹نێرانە بێرە مەیدان!› 🇮🇷 شُجاعانه

**نێرایەتی** / nĕrayetî/: ☜ **نەرەیی**

**نێرباز** / nêrbaz/: ئاوەڵناو. *[ئاشیرین]* بەچەباز 🇮🇷 نرباز

**نێربازە** / nĕrbaze/: ئاوەڵناو. *[ئاشیرین]* فیسکوو؛ بەچەباز (بۆ پیاو) 🇮🇷 بچّه‌باز

**نێربازی** / nêrbazî/: ناو. *[ئاشیرین]* بەچەبازی 🇮🇷 نربازی

**نێربلۆکێ** / nêrb(i)lokê/: ئاوەڵناو. نێرەکوڕکە؛ ژنێ کە لاسای پیاوان دەکاتەوە 🇮🇷 زنی کە ادای مردان را درآورد

**نێرتک** / nêrtik/: ناو. نێرک؛ نێرەکورکە: ١. نەروو؛ نێری؛ لاسکی سەرەکی و تونەدی ناوەڕاستی گیا ٢. ڕەقایی زەقی ناوکوان ⊟ ١. ساقەی اصلی نباتات ٢. مغز سِفت دُمل

**نێرتکەڕێواس** / nêrtkeřêwas/: ناو. چەکری ⊟ جوانەی ریواس

**نێرتن** / nêrtin/: ☜ نواڕین

**نێرخواز** / něrxiwaz/: ئاوەڵناو. بەبا؛ وەبا ⊟ نرخواه

**نێردران** / nêrd(i)ran/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //نێردرای؛ دەنێردرێی؛ بنێردرێ// ناردران؛ هەناریان؛ ڕەوانە کران ⊟ فرستاده شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: نێردراو/ چاوگی نەرێنی: نەنێردران

**نێردراو** / nêrd(i)raw/: ئاوەڵناو. ناردراو؛ هەناریاگ؛ ڕەوانەکراو ⊟ فرستاده شده

**نێردە** / nêrde/: ئاوەڵناو. ناردراو؛ هەناریاگ؛ ڕەوانەکراو ‹نێردەی خاچی سوور بۆ کاروباری ئاوارەکان، گەیشتە کوردستان› ⊟ فرستاده

**نێردیوان** / nerdîwan/: ☜ نەردیوان

**نێرسایا** / nêrsaya/: ئاوەڵناو. پێگەیشتوو؛ پێگەیو ⊟ رسیده و بەبار آمده

**نێرک** / nêrik/: ☜ نێرتك

**نێرکە** / nêrke/: ناو. ١. دەرهاتوو لە دمەڵ ٢. چووزەی گیا ⊟ ١. تودەی بیرون آمده از دُمل ٢. نُک تازه بردمیدەی گیاه

**نێرکەبڕە** / nêrkeb(i)ře/: ناو. مێروویەکی پچووکە ئافاتی لاسکی دەغڵە ⊟ حشرەای ساقەخور

**نێرگز** / nêrgiz/: ناو. نەرگز؛ نەرگس؛ نێرگس؛ نەریس؛ نێریس؛ زەریم؛ زەریم؛ گوڵێکی سپی ئاوزەردی زۆر بۆنخۆشە؛ بنکی هەیە و لە سەرە بەهاردا دەڕوێ ⊟ نرگس

**نێرگزجاڕ** / nêrgizcař/: ☜ نێرگزەجاڕ

**نێرگزدەبان** / nêrgizdeban/: ناو. تیخی دەبانی جەوهەردار ⊟ نوعی تیغ خنجر و شمشیر بافرند

**نێرگزە** / nêrg(i)ze/: ☜ نەرگزە

**نێرگزەجاڕ** / nêrg(i)zecař/: ناو. نەرگزجاڕ؛ نەرگسجاڕ؛ نەرگسەجاڕ؛ نێرگزجاڕ؛ نێرگسەجاڕ؛ نەرێسەڵە ⊟ نرگس‌زار

**نێرگزی** / nêrg(i)zî/: ئاوەڵناو. نەرگزی؛ نەرگسی؛ نێرگسی: ١. بە ڕەنگی نێرگز ٢. سەبارەت بە نێرگزەوە ⊟ ١. به رنگ نرگس ٢. نرگسی

**نێرگس** / nêrgis/: ☜ نێرگز

**نێرگسەجاڕ** / nêrg(i)secař/: ☜ نێرگزەجاڕ

**نێرگسی** / nêrg(i)sî/: ☜ نێرگزی

**نێرگەلە** / nêrgele/: ناو. قلیانئاوی؛ نەرگیلە ⊟ قلیان

**نێرگەلەچی** / nêrgeleçî/: ناو. قلیاندار ⊟ قلیاندار

**نێر ـ ما** / nêr ma/: ☜ نێروما

**نێرمامز** / něrmamiz/: ناو. کلاس؛ کەلاس؛ ئاسکی نێر ⊟ آهوی نر

**نێرمایی** / nêrmayî/: ناو. چۆنیەتی ڕەگەز لە باری نێر و مێوە ⊟ جنسیّت

**نێرمۆ** / nêrmo/: ☜ نێرەمۆک[٢]

**نێرمۆک** / nêrmok/: ☜ نێرەمۆک[٢]

**نێرمەندۆک** / nêrmendok/: ☜ نێرەمۆک[٢]

**نێروما** / nêr û ma/: ئاوەڵناو. نێر ـ ما؛ خاوەن تایبەتمەندیگەلی هەردوو جنسی نێر و مێ ⊟ دوجنسی

**نێرومێ** / nêr û mê/: ناو. نەرما؛ نەرمادە؛ نەڕوما؛ نێرامێ؛ نێرەومێیە؛ قرتە؛ قرتێنە؛ بەرەزبانە؛ بەرەزوانە؛ مەلەزوانە؛ ئالقەزوونە؛ جووت‌بشکوژێ کە دەچنە ناو یەک ⊟ نرومادە؛ سگک

**نێرۆ** / nêro/: ناو. ١. نێروو؛ کەڵەکێوی؛ حەیوانە کێوی نێر ٢. شاخی حەیوانە کێوی ⊟ ١. پازن؛ کل کوهی ٢. شاخ کل کوهی

**نێرۆک** / nêrok/: ناو. ئاوخۆرەی ڕوەک؛

ناوەڕاستی نێرتک ☰ آوند نباتات

**نێرو** / nêrû/: ناو. ١. کەڵی کێوی؛ بزنەکێوی نێر ٢. شاخی کەڵی کێوی ‹دەسکی خەنجەرم نێرووە› ٣. کۆستەکی خەنجەر ☰ ١. بُز نر کوهی ٢. شاخ کل کوهی ٣. نوار خنجربند

**نێروک** / nĕrûk/: ناو. سیپەلە؛ سیپەرە؛ باوەشێنە ☰ سرخس

**نێره**[١] / nêre/: ناو. ١. ناوەڕاست و خوارێی ئاو ‹خۆی لە نێرەی چەمەکە دا› ٢. شەقەجۆگەی ناو زەوی ٣. مەشکەی لە دار ٤. هەر شتێکی زەق بچێتە ناو ئاڵقەوە ‹نێرە و مێیە گریی بدە› ٥. *[کینایە]* بنیادەمی ئازا و بەکار ☰ ١. وسط جریان رودخانە ٢. جویبار وسط زمین کشت ٣. مَشک چوبین ۴. هر ابزار برآمدەای کە در حلقەای رود ۵. آدم شجاع و کارا

**نێره**[٢]: ناوەڵناو. نێر؛ نەڕ؛ جووتی مێوینە (جانەوەر) ‹ئەم دوو کۆترە نێرە و مێنگەن› ☰ نر (حیوان)

**نێره ـ**[٣]: پێشوشە. ١. نێر؛ نەڕ ‹نێرەکەر› ٢. *[کینایە]* ئازا ٣. *[کینایە]* زل؛ زلە ☰ ١. نره ـ ٢. راد ـ ٣. گُنده

**نێرەبزن** / nĕrebizin/: ناو. تگە؛ تەجە؛ نێری؛ سابرێن ☰ تَکە؛ شاک

**نێرەبەراز** / nĕreberaz/: ناو. ئێکانە؛ یەکانە؛ بڕەک ☰ خوک نر

**نێرەپاساری** / nĕrepasarî/: ناو. باوانە؛ نێرەچۆلەکە ☰ گُنجشک نر

**نێرەپۆڕ** / nĕrepoř/: ناو. ئەڤدال؛ عەبدال؛ عەبدال؛ ناودەڵ ☰ دُرّاج نر

**نێرەپەز** / nĕrepez/: ناو. وەرهان؛ بەران؛ وەران ☰ گوسفند نر؛ قوچ

**نێرەپیاو** / nêrep(i)yaw/: ناو. *[کینایە]* پیاگی زۆر بەدەسەڵات و بەزاکوون ☰ مرد قدرتمند و باراده

**نێرەپێخەسو** / nêrepêxesû/: ناو. *[دایی کوڕ]* پیاوی خزمی بووک کە لەگەڵی دەچوو بۆ ماڵی زاوا ☰ مردی کە همراه عروس بە خانەی داماد می‌رفت

**نێرەحەیتە** / nêreḧeyte/: ☜ **نێرەزەلام**

**نێرەزەلام** / nêrezelam/: ناوەڵناو. نێرەحەیتە؛ زەبەلاح و تەژەی ناقۆڵا ☰ لندهور

**نێرەژن**[١] / nêrejin/: ناو. نێرەژەن؛ دۆژەنگ ☰ چوب زبانەدار مشک

**نێرەژن**[٢]: ناوەڵناو. زۆر ئازا و زانا (ژن) ☰ شجاع و دانا (زن)

**نێرەژەن** / nêrejen/: ☜ **نێرەژن**[١]

**نێرەڤان** / nêrevan/: ناو. نێرینڤان؛ تواشاکەر لە ڕوانگەوە ☰ دیدبان

**نێرەک** / nêrek/: ناو. ناوەند؛ چەق؛ دوڕ؛ ناوەڕاست ☰ وسط

**نێرەککەر** / nêrekker/: ☜ **نێرەکەر**

**نێرەکورکە** / nêrekurke/: ☜ **نێرتك**

**نێرەکوڕ** / nêrekuř/: ناوەڵناو. بژاردە و بەکار ☰ شایستە و کارا

**نێرەکوڕکە** / nêrekuřke/: ☜ **نێربلۆکێ**

**نێرەکوللە** / nêrekulle/: ناو. شێرەکوللە؛ جۆرێ کوللەی درشتی شین ☰ نوعی ملخ درشت و سبزرنگ

**نێرەکەر** / nêreker/: ناو. نێرەککەر: ١. کەری نێر ٢. *[مەجاز]* پیاوی ئازای بێ ئاوەز ☰ ١. نرەخر ٢. آدم متهور و احمق

**نێرەکەو** / nêrekew/: ناو. بەق؛ لفی ماکەو؛ کەوی نێر ☰ کبک نر

**نێرەکی** / nêrekî/: ناو. ئێستری کە ئەندامی نێرینەی هەیە ☰ استر نر

**نێرەگیسک** / nêregêsk/: ناو. گیسکی نێر ☰ بُزغالەی نر

**نێرەموک** / nêremuk/: ناوەڵناو. ١. ☜ **نێرەمۆك**[٢] ٢. نەزۆک (گامیش) ☰ ١. ☜ **نێرەمۆك**[٢] ٢. نازا

(گاومیش)

**نێرەمۆک**[1] / nêremok/: ناو. نێرەمووک: ١. تێک‌هەڵکێشی دار کە نەجاڕ دەیکەن ٢. کون و کلیلی گۆڵە ٣. تۆپە پەڕۆی کون‌ئاخنی ئەستێر ☰ ١. سگک نجاری ٢. قفل و کلید چوبین ٣. دربوش پارچەای مجرای آب

**نێرەمۆک**[2]: ئاوەڵناو. نێرەمووک؛ نەنێر نەمێ؛ نەنێر نەمێو؛ نێرمۆ؛ نێرمۆک؛ نێرمەندۆک؛ نێرەموک؛ نێرەمەندۆک؛ نێرەومێیە؛ بەبێ ئەندامی ڕەگەزی کارا ☰ خنثی؛ نرموک

**نێرەموک** / nêremûk/: ☜ **نێرەمۆك**

**نێرەمەڕ** / něremeř/: ناو. بەران؛ کەوە؛ وەران؛ قۆچ؛ پەزی نێر ☰ قوچ

**نێرەمەندۆک** / něremendok/: ☜ **نێرەمۆك**[2]

**نێرەنگ** / nêreng/: ناو. ١. جادوو؛ سیحر ٢. جادووگەر ☰ ١. جادو ٢. جادوگر

**نێرەنێر** / nêrenêr/: دەنگەناو. قیژەقیژی پشیلە ☰ جیغ و داد گربه

**نێرەو** / nêrew/: ناو. شەقەجۆگەی ناو زەوی ☰ جوی اصلی در کشتزار

**نێرەومێیە**[1] / nêre w mêye/: ☜ **نێرومێ**

**نێرەومێیە**[2]: ☜ **نێرەمۆك**[2]

**نێرەوەز** / nêrewez/: ناو. نێرینە؛ نێر خولقاو ☰ نرینه

**نێری** / nêrî/: ناو. ١. کەڵەکێوی شاخداری نێر ٢. بزنی نێری خۆماڵی ٣. شوێنی قووڵتر و بەتەوژمتر لە چەم ٤. ☜ **نێرتك ـ١** ☰ ١. پازن ٢. تکه؛ شاک ٣. جای عمیق‌تر و پُرفشارتر رودخانه ۴. ☜ **نێرتك ـ١**

**نێریاییش** / nêryayîş/: چاوگ. ڕاتلەکاندن و تێک‌وەردانی تراو ☰ به هم زدن مایع

**نێریخواز** / něrîx(i)waz/: ئاوەڵناو. بەتەگە؛ نێرخواز (بزن) ☰ نرخواه (بُز)

**نێریس** / něrîs/: ☜ **نێرگز**

**نێرینڤان** / nêrînvan/: ☜ **نێرەڤان**

**نێرینە** / nêrîne/: ناو. ١. ناوەڕاستی ڕووبار؛ قووڵتر جێگە لە ناو ڕووباردا ٢. ئەولادی نێر ☰ ١. وسط و عُمق رودخانه ٢. فرزند ذکور

**نێریەتی** / něryetî/: ☜ **نەڕەیی**

**نێرییەکێوی** / nêrîyekêwî/: ناو. کەڵەکێوی؛ نێرەبزنی چیا ☰ بُز نر کوهی

• **نێڕ** / nêř/: پاشەوشە. ـ نۆڕ؛ ـ ڕوان؛ تماشا ‹چاونێڕ› ☰ نگاه

**نێڕان** / nêřan/: ☜ **نواڕین**

**نێڕگە** / nêřege/: ناو. ڕوانگەی نێرەڤان ☰ جای دیدبان

**نێڕین** / nêřîn/: ☜ **نواڕین**

**نێز**[1] / nêz/: ناو. برسییەتی؛ برسیایەتی ☰ گرسنگی

**نێز**[2]: ئاوەڵناو. ١. برسی؛ برچی ‹نێز بووین، تێرمان کردی› ٢. ☜ **نزیك** ☰ ١. گرسنه ٢. ☜ **نزيك**

**نێزاتی** / nêzatî/: ناو. برسییەتی؛ برسیاتی ☰ گرسنگی

**نێزک** / nêzik/: ☜ **نزيك**

**نێزگ** / nêzig/: ☜ **نزيك**

**نێزنگ** / nêzing/: ☜ **نزيك**

**نێزە** / nêze/: ناو. نەیزە؛ ڕمب؛ ڕم؛ سونگی؛ سوننی؛ مێلەیەکی بەرز و نووک‌تیژ، بۆ شەڕ و وەرزش ‹چوار سەرباز لە پێشمەوە بە تفەنگەوە و چوار لە پشتمەوە بە کەلەپچەکراوی بردیانم و نێزەکانیان لە سەر قوونم ڕاگرتبوو «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ نیزه

**نێزەک** / nêzek/: ناو. شۆڵە؛ تیرئەستێرە؛ ئەستێرەی ڕاخوشیو ☰ شهاب

**نێزی**[1] / nêzî/: ناو. برسییەتی؛ نێزاتی؛ برچێتی؛ برسیایەتی ☰ گرسنگی

**نێزی**[٢]: ئامراز. یان؛ یاخۆ ☚ یا

**نێزیک / nêzîk/**: ☜ نزیك

◘ **نێزیک بـوون**: ١. دوور نـەبوون ٢. [کنایـە] سەرجێیی کردن ☚ ١. نزدیک بودن ٢. نزدیکی کردن

**نێزیکاهی / nêzîkahî/**: ئاوەڵکار. بەم زوانـە ☚ بـە زودی

**نێزیکی / nêzîkî/**: ☜ نزیکی

**نێزینک / nĕzînk/**: ☜ نزیك

**نێزینگ / nêzîng/**: ☜ نزیك

**نێژ**[١] **/ nêj/**: ناو. ١. کاری بناغە داڕژتنی خانوو ٢. ☜ نویژ ☚ ١. پی‌ریزی بنا ٢. ☜ نویژ

**ـ نێژ**[٢]: پاشەوشـە. بنێـژ: ١. چـەقین ‹شـەتڵ‌نێـژ؛ دارنێژ› ٢. بسپێر ‹مردوونێژ› ☚ ١. ـ کار ٢. ـ سپار

**نێژا / nêja/**: ئاوەڵناو. بناغەداڕژاو ☚ پی‌ریزی شده

**نێژانـدن / nêjandin/**: چـاوگ. ناشـتن؛ نیـان ☚ کاشتن

**نێژتن / nêjtin/**: چـاوگ. ناشـتن: ١. بـن گـڵ خسـتن ٢. چەقانـدنی شـەتڵ ☚ ١. بـە خـاک سپردن ٢. کاشتن نشا

**نێژدی / nêjdî/**: ☜ نزیك

**نێژران / nêjran/**: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //نێـژرای؛ دەنێژرێی؛ بنێژرێ// ناژران: ١. بن گڵ خران ‹لـە نێو ئەم گۆڕە هەژار نێژراوە/ زۆر لە ڕێی ئێوە جـەفای کێشاوە «هەژار، بۆ کوردستان»› ٢. چـەقان؛ نـران ☚ ١. دفن شدن ٢. کاشته شدن نشا

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: نێـژراو/ چـاوگی نـەرێنی: نەنێژران

**نێـژراو / nêjraw/**: ئاوەڵـناو. ١. بـن گـڵ خـراو ‹شەهیدی بێ‌کفن نێژراو› ٢. چەقێنراو ☚ ١. دفن شده ٢. کاشته شده

**نێژکاری / nêjkarî/**: نـاو. کـاری بناغـەی خـانوو داڕژتن ☚ پی‌ریزی بنا

**ـ نێژی / nêjî-/**: پاشەوشە. ـ بسپێری ☚ ـ سپاری

**نێسـک / nêsk/**: نـاو. ١. ☜ نێسـکە ٢. ☜ نیسك[١]

**نێسکان / nêskan/**: چاوگ. سەما و گەمە کـردنی ئەسپ ☚ رقصیدن و خرامیدن اسب

**نێسکە / nêske/**: ناو. نێسک؛ سـەمای ئەسـپ ☚ رقص و خرام اسب

**نێش**[١] **/ nêş/**: ناو. چز ☚ نیش

**نێش**[٢]: پێرۆ. ← ئێش‌ونێش

**نێشتەر / nĕşter/**: ☜ نشتەر

**نێفۆک / nêfok/**: ☜ نافەك

**نێفەک / nêfek/**: ☜ نافەك

**نێڤ / nêv/**: ناو. نێو؛ ناو ☚ میان

**نێڤـتـەنگ / nêvteng/**: نـاو. خاڵـیگە؛ کەلەکـە؛ برک ☚ تُهیگاه

**نێڤکۆ / nêvko/**: ناو. دالانی نێوان ژووران لە مـاڵا ☚ راهرو

**نێڤی / nĕvî/**: ناو. نافنج؛ مامناوەند ☚ میانه

**نێک**[١] **/ nêk/**: نـاو. ١. پێشـەی ڕان ٢. جووچکـە سمت؛ خوارتر ئێسکی مۆغەرە ٣. نووک؛ سەری تیژی هەر شتێ ☚ ١. استخوان ران ٢. اسـتخوان دنبالچه ٣. نُک هر چیز

**نێک**[٢]: ئامراز. یان؛ ئان؛ یاخۆ ☚ یا

**نێکە / nêke/**: ئامراز. یان ؛ ئان؛ یاخۆ ☚ یا

**نێکێ / nêkê/**: ☜ نەنك

**نێل / nêl/**: ناو. ١. جێگەی تەڕەزن و بە شـینایی لە قەدی کێودا ٢. ☜ نوال ☚ ١. جـای نمـدار و سبز در کمر کوه ٢. ☜ نوال

**نێڵ / nêł/**: ناو. ١. نێڵە؛ گڕی ئاگری زۆر بەتەوژم ٢. ☜ نوێڵ ☚ ١. لهیب آتش ٢. ☜ نوێڵ

◘ **نێڵ دان**: گڕی زۆر بەتەوژم سـازدان ‹شـەوانی سەرما سـۆپەمان نـێل دەدا... «هـەژار، چێشـتی مجێور»› ☚ برافروختن هرچه بیشتر آتش

**نێڵه / nêłe/**: ناو. ١. ☜ **نێڵ ـ١** ٢. نێری ملی گاجووت ☰ ١. ☜ **نێڵ ـ١** ٢. یوغ شخم‌زنی

**نێڵدراو / nêłd(i)raw/**: ئاوەڵناو. زۆر بە تەوژم و بەتین (ئاور) ☰ افروخته

**نێم**[1] **/ nêm/**: ناو. کێم؛ زووخ؛ چڵکی برین ☰ ریم و چرک زخم

**نێم ـ**[2]: پێشوشە. نیم ـ؛ نیوـ ☰ نیم ـ

**نێمە / nême/**: ئاوەڵناو. ١. نیوە؛ نیم ٢. نیوەیی؛ هاوبەشی ☰ ١. نصف ٢. نصف به نصف

**نێمەردەن / nêmerden/**: ئاوەڵناو. هەرماو؛ نەمر ☰ جاوید

**نێملا / nêmla/**: ناو. نێم‌لەت؛ نێم‌لەتە؛ چارەگ؛ لە چوار پاژ پاژێک ☰ یک چهارم

**نێملەت / nêmlet/**: ☜ **نێملا**

**نێملەتە / nêmlete/**: ناو. ١. ☜ **نێملا** ٢. /کنایە/ پارچەیەک نان ☰ ١. ☜ **نێملا** ٢. قطعه‌ای نان

**نێن / nên/**: ☜ **نوێن**

**نێنگوێن / nêng(i)wên/**: ☜ **نوێن**[1]**ـ٢**

**نێنگون / nêngûn/**: ☜ **نوێن**[1]**ـ٢**

**نێنگین / nêngîn/**: ☜ **نوێن**[1]**ـ٢**

**نێنێ / nênê/**: ئاوەڵکار. نا نا؛ نە نە ☰ خیر؛ نه نه

**نێو / nêw/**: ناو. ١. ناو؛ ناڤ؛ نام؛ نامە؛ نۆمە؛ نووم ‹نێوت چییە؟› ٢. ژوور؛ ناو ‹نێو ماڵ› ٣. لا؛ توێ؛ ناو ‹سەری کوڵمت لە نێو زوڵفی سیادا/ ئیشارێکە لە نووری شەوچرادا «وەفایی»› ٤. ناوان؛ مەڵبەند؛ ناوچە ‹قەدەرێ ماڵمان لەو نێوە بوو› ☰ ١. نام ٢. درون؛ داخل ٣. لا؛ لایه ٤. ناحیه؛ منطقه

⊡ **نێو بردن**: ناڤ برن؛ ناو بردن ☰ ذکر کردن

**نێو نان**: ☜ **ناو لێ‌نان**

**نێوئاخن / nêw'axin/**: ☜ **ناواخن**

**نێواچی / něwaçî/**: ناو. دەلال ☰ دلال؛ واسطه

**نێواخن / nêwaxin/**: ☜ **ناواخن**

**نێوان**[1] **/ nêwan/**: ناو. ١. مابەین ‹مەی فڕ کە! مەترسێ بە قەرز، نازانی/ نێوانی هەناسەیەک دەژی یان دەمری؟ «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ٢. ناوەڕاست ‹لە دەوری سەریان، دەسڕۆکەی هەوری/ وەک مانگی چاردە، لە نێوان هەوری «سەیفولقوزات»› ٣. مەودا ‹لەو دەمەیدا کە دەمژن شەکرەلێوان/ لەو دەمەیدا نەبێ لەمپەر و نێوان «هێمن»› ٤. /مەجاز/ پێوەندی و دۆستایەتی ‹نێوانمان خۆشە› ☰ ١. میانه ٢. میان ٣. فاصله ٤. رابطه‌ی دوستی

⊡ **نێوان تێکچوون**: هەڵوەشاندنەوەی دۆستایەتی ☰ به هم خوردن رابطه‌ی دوستی

**نێوان خۆش بوون**: پێکەوە دۆست بوون؛ پێکەوە هاتوچۆ کردن ☰ رابطه‌ی خوبی داشتن

**خستنە نێوانەوە**: ١. خستنە ناوەڕاستەوە ٢. هێنانە ئاراوە * هەروەها: **کەوتنە نێوانەوە؛ هاتنە نێوانەوە** ☰ ١. در میان انداختن ٢. در وسط قرار دادن

**نێوان**[2]: ئامراز. بەینی؛ نێوانی ‹منیان ناردە سەرای لای سەقز کە مابەین بم و ئاگادار بم عەشایر ئاڵۆزی نەنێنەوە. نامەی نێوان دوژمن و دۆست پێک بگۆڕینەوە «هەژار، *چێشتی مجێور*»› ☰ میانِ

**نێوانبڕ / něwanbiř/**: ئاوەڵناو. لابڕ؛ سەربڕ؛ قەدبڕ ☰ میانبُر

**نێوانتێکدەر / něwantěkder/**: ئاوەڵناو. بەزاجکەر؛ چوکڵەشکێن ☰ تفرقه‌انداز

**نێوانجیکەر / něwancîker/**: ناو. ناوبژی؛ ناوجی ☰ میانجی

**نێوانخۆش / něwanxoş/**: ئاوەڵناو. ئاشت؛ تەبا ☰ آشتی

**نێوانخۆشی / nêwanxoşî/**: ناو. دۆستایەتی ☰ دوستی

**نێوان‌ساڵ / něwansał/**: ☜ **ناڤساڵ**

**نێوانگر** / nêwangir/: ☜ **نێوگر**

**نێواناخۆشی** / nêwannaxoşî/: ناو. دوژمنی ☰ دشمنی

**نێوانە** / nêwane/: ناو. ناونج؛ بەرئەنجام؛ ئەوی لە ناوەڕاستدایە ☰ میانگین

**نێوبار** / nêwbar/: ناو. ناوبار؛ ناوتا؛ نێوتا؛ سەربار؛ ناڤبار؛ ناوکۆ؛ زێدەبار؛ نردۆک؛ بارێ کە دەخرێتە سەر باران ☰ اضافەبار

**نێوبانگ** / nêwbang/: ☜ **ناوبانگ**

**نێوبراو** / nêb(i)raw/: ☜ **ناوبراو**

**نێوبرێشک** / nêwb(i)rêşk/: ☜ **نانبرێشك**

**نێوبڕ** / nêwbiř/: ☜ **ناوبڕ**

**نێوبژە** / nêwb(i)je/: ☜ **نێوبژی**

**نێوبژەکەر** / nêwb(i)jeker/: ☜ **ناوبژی ـ۲**

**نێوبژی** / nêwb(i)jî/: ☜ **ناوبژی**

**نێوبژیکەر** / nêwb(i)jîker/: ☜ **ناوبژی ـ۲**

**نێوبژیوان** / nêwb(i)jîwan/: ☜ **ناوبژی ـ۲**

**نێوبژیوانی** / nêwb(i)jîwanî/: ناو. کاری ناوبژی کردن ☰ میانجیگری

**نێوبوێر** / nêb(i)wêr/: ☜ **ناوبوێر**

**نێوبەنێو** / nêwbenêw/: ☜ **ناوبەناو**

**نێوپڕ** / něwpiř/: ناوەڵناو. بەناڤ؛ پتەو ☰ توپُر

**نێوتا** / nêwta/: ☜ **نێوبار**

**نێوتان** / nêwtan/: ناو. تیغە؛ نێوان ☰ تیغە

**نێوجەرگە** / nêwcerge/: ☜ **ناوجەرگە**

**نێوجەغز** / nêwceğz/: ناو. ناوەڕاستی کۆز ☰ وسط دایره

**نێوجێژنان** / nêwcêjnan/: ناو. ناوجەژنان؛ ناوجێژنان؛ مانگی پێش قوربان و دوای شەشەڵان ☰ ماه ذیقعده

**نێوچاو** / nêwçaw/: ناو. ۱. بەینی دوو برۆ ۲. دوڕ چاو؛ ناو چاو ۳. *[مەجاز]* بەخت؛ چارە ☰ ۱. وسط دو ابرو ۲. وسط چشم ۳. بخت؛ شانس

**نێوچاوان** / nêwçawan/: ناو. ناوچاو؛ ناوچاوان؛ نێوچاو؛ ناوچەوان؛ ناڤچاڤ: ۱. توێڵ؛ ئەنی ۲. *[مەجاز]* بەخت؛ شانس ☰ ۱. پیشانی ۲. شانس

⊡ **نێوچاوان تێکدان** ڕوو تاڵ کردن ☰ اخم کردن

**نێوچاوان پاک** / nêwçawan pak/: ناوەڵناو. *[مەجاز]* ناوچاوان پاک؛ ناوچاوپاک؛ ناوچاوڕۆشن؛ ناوچەوان پاک؛ ناوچەوان ڕوون؛ بەودم؛ ممبارەک ☰ خوش‌طالع

**نێوچاوان پیس** / nêwçawanpîs/: ناوەڵناو. *[مەجاز]* شووم؛ نەحس ☰ نحس؛ شوم

**نێوچاوان ڕەش** / nêwçawan řeş/: ناوەڵناو. *[مەجاز]* بەدبەخت؛ چارەڕەش ☰ سیاه‌بخت

**نێوچاوان گرژ** / nêwçawangirj/: ناوەڵناو. *[مەجاز]* ناوچەوان ترش؛ ناڤچاڤ ترش؛ ناوچاوتاڵ؛ ناوچاوترش؛ ناوچاوان ترش؛ ناوچاوترشاو؛ ناوچاوترشیاگ؛ ناوچاودێز؛ ناوچاوگرژ؛ ناوچەوان گرژ؛ ڕووگرژ؛ ڕووترش؛ مرومۆچ ☰ اخمو

**نێوچۆمان** / nêwçoman/: ناو. ناوچۆمان؛ ناوڕوان؛ هاوران؛ زەوینی نێوان دەجلە و فورات ☰ بین‌النهرین

**نێوخۆ** / nêwxo/: ☜ **ناوخۆ**

**نێودار** / nêwdar/: ناوەڵناو. ناڤدار؛ ناڤدێر؛ نامدار؛ نامەدار؛ نامی؛ نامییە؛ ناودار؛ ناودێر؛ نۆمدار؛ بەناوبانگ ☰ نامدار؛ پرآوازه

**نێودەست** / nêwdest/: ☜ **ناودەست**

**نێودەڵە** / nêwdełe/: ناو. پلەی پەیژە و نەردیوان ☰ پلەی نردبان

**نێورین** / nêw(i)rîn/: چاوگ. نەرمە گۆرانی گوتن ☰ ترنُم کردن

**نێوڕان** / nêwřan/: ناو. ناوگەڵ؛ نێوان هەر دوو ڕان ☰ میان ران‌ها

**نێوڕوان** / nêwř(i)wan/: ناو. ناو چۆمان؛ ناو ڕوان ☰ وسط رودخانه

**نێوشکێن** / nêwş(i)kên/: ناو. کاری نووشتاندنەوەی قەراغی دوو بەشە پارچەی پێکەوە دووراو لە دیوی ناوەوە ‹ئەگەر ڕیزەکەت لێ دا بە ئوتوو نێوشکێنی کە!› 🇮🇷 عمل تا کردن کنارەی پارچەی دوختە شدە از داخل

**نێوقەد** / nêwqed/: ناو. پشتێنە؛ کەمەر 🇮🇷 کمر

**نێوک** / nêw(i)k/: ☜ ناوك

**نێوکەڕەشە** / nêwkeřeşe/: ناو. ناوەڕاستی پشتی یەکسم کە کورتان دەکەوێتە سەری 🇮🇷 وسط پُشت الاغ

**نێوگر** / nêwgir/: ناو. *[ڕێزمان]* نێوانگر؛ پیتێ کە دەچێتە نێوان وشەیەک و وشەیەکی نوێ دروست دەکا 🇮🇷 میانوند

**نێوگۆڕک** / nêwgořik/: ☜ ناوگۆڕك

**نێوگەڵ** / nêwgeł/: ☜ ناوگەڵ

**نێوڵ** / něwił/: ☜ نێوەڵ

**نێوماڵ** / nêwmał/: ☜ ناوماڵ

**نێونجی**[1] / nêwincî/: ناو. ١. ناونجی؛ دەستە ٢. ☜ ناوبژی 🇮🇷 ١. میانە؛ متوسط ٢. ☜ ناوبژی

**نێونجی**[2]: ئاوەڵناو. نێوان گەورە و گچکە 🇮🇷 میانی

**نێونرتکە** / něwnirtke/: ☜ ناونیتکە

**نێونەتەوەیی** / nêwneteweyî/: ئاوەڵناو. ناڤنەتەوەیی؛ ناڤنەژادی؛ سەر بە گەلانی دنیا 🇮🇷 بین‌المللی

**نێونیرە** / nêwnîre/: ناو. دوو داروو‌کەی قیت لە ناوەڕاستی نیری ملی گاجووتدا 🇮🇷 دو چوب کوچک وسط یوغ

**نێوونرتکە** / nêw û nirtke/: ☜ ناونیتکە

**نێوە** / něwe/: ناو. ستوون؛ ئەستوون؛ ئەستوندەک 🇮🇷 ستون

**نێوەر** / něwer/: ناو. *[شوورەیی]* بەلۆکە؛ بەلووکە؛ بەلەمیتکە 🇮🇷 چوچوله

**نێوەڕاس** / nêweřas/: ☜ ناوەڕاست

**نێوەڕاست** / nêweřast/: ☜ ناوەڕاست

**نێوەڕاستی** / něweřastî/: ☜ ناوەڕاسین

**نێوەڕۆ** / nêweřo/: ☜ نیوەڕۆ

**نێوەس** / nêwes/: ئاوەڵناو. ١. ☜ نەخۆش ٢. ناخۆش؛ بێ‌تام 🇮🇷 ١. ☜ نەخۆش ٢. بدمزه

**نێوەسانی** / nêwesanî/: ☜ نەخۆشی

**نێوەش** / nêweş/: ئاوەڵناو. ١. ☜ نەخۆش ٢. ناخۆش؛ بێ‌تام 🇮🇷 ١. ☜ نەخۆش ٢. بدمزه

**نێوەشاگەدی** / nêweşagedî/: ناو. ژنی زکپڕ 🇮🇷 زن حامله

**نێوەشانی** / nêweşanî/: ☜ نەخۆشی

**نێوەشەن** / nêweşen/: ☜ نەخۆشی

**نێوەشەی**[1] / nêweşey/: ناو. ١. ☜ نەخۆشی ٢. زکپڕی 🇮🇷 ١. ☜ نەخۆشی ٢. حاملگی

**نێوەشەی**[2]: ئاوەڵناو. ناپەسەند 🇮🇷 ناپسند

**نێوەشی** / nêweşî/: ناو. ١. ☜ نەخۆشی ٢. تام ناخۆشی 🇮🇷 ١. ☜ نەخۆشی ٢. بدمزگی

**نێوەشینە** / nêweşîne/: ☜ نەخۆشی

**نێوەشییە** / nêweşîye/: ☜ نەخۆشی

**نێوەک** / nêwek/: ناو. چاکی؛ چاکە 🇮🇷 نیکی؛ کار نیک

**نێوەڵ** / něweł/: ناو. نێوڵ؛ گرانیگا؛ قورسایی‌گە؛ خاڵی قورسایی 🇮🇷 گرانیگاه

**نێوەن** / nêwen/: ناو. ناوقەد؛ نێوقەد ‹لای ژووری سەمەن، نێوەنی گوڵ، دامەنی سونبول/ لەو سوورەت و مەعنایە کە سەد جەننەتی لەغزە «حاجی قادر»› 🇮🇷 میان؛ کمر

**نێوەند** / nêwend/: ☜ مۆرانە

**نێوەندا** / nêwenda/: ☜ نەخوێندەوار

**نێوەندە** / nêwende/: ☜ نەخوێندەوار

**نێهری** / něhrî/: ناو. نێری؛ تەکە؛ تەجە؛ سابرێن 🇮🇷 نهاز؛ تکه؛ پیشرو گله

**نێ‌هەرێ** / nêherê/: ناو. نەخێر؛ نە 🇮🇷 خیر؛ نه

# و

**و / w/**: پیت. نیشانەی پیتی بیست و هەشتەمی ئەلفوبێی زمانی کوردی 🇮🇷 و؛ نشانەی بیست و هشتمین حرف الفبای زبان کُردی

**و¹ / wi/**: ناو. پیتی بیست و هەشتەمی ئەلفوبێی زمانی کوردی 🇮🇷 و؛ بیست و هشتمین حرف الفبای زبان کُردی

**و²**: جێناو. ١. ئەو؛ سێهەم کەسی تاک (بۆ نێر) کە دەکەوێتە پێش ڕستەوە ‹و گوت؛ واتا: پیاوەکە گوتی؛ و هات؛ واتا: پیاوەکە هات› ٢. ت؛ لکاوی فاعیلی دووهەم کەسی تاک، دوای پیتی دەنگدار ‹کتێوەکە داو پێم خوەندم› 🇮🇷 ١. ضمیر مذکر، کە پیش از جمله آید ٢. ی؛ ضمیر فاعلی دوم شخص مفرد

**و³**: ئامراز. ١. جێگری بزاوی بۆر (لە شوێن پیت دێ) ‹کوڵ؛ کورد› ٢. پیتی پەیوەندی بۆ پێک گرێدانی چەند وشە یان بەشگەلی ڕستە ‹جێ و بان؛ خا و خیزان› ٣. بە؛ وە ‹و سان؛ و لا› ٤. پیتی سەیرمان و جێ بڕوا نەبوون ‹سەگ و مزگەوت؟!؛ تۆ و قومار؟!› 🇮🇷 ١. جانشین ضمّه در رسم‌الخط کُردی ٢. و؛ حرف ربط ٣. به ٤. حرف تعجب

**ـ و⁴**: پاشگر. ١. دەلکێتە پاشەوەی ڕەگی سێهەم کەسی تێنەپەڕی ڕابردووی هەندێک کارەوە و ئاوەڵناوێکی بەرکاری پێک دەهێنێ ‹سووتاو؛ خوراو؛ گۆڕاو› ٢. دەگەڵ؛ ڕەگەڵ ‹وە ماڵ و منالەو هاتگن› 🇮🇷 ١. ـه؛ پسوند مفعولی ٢. با

**وا¹ / wa/**: ناو. ١. با؛ بێ ‹وای شەماڵ› ٢. خوشک؛ خۆیشک؛ خوەھ ٣. کات؛ هەل ‹لە وای بەیاندا هاتم نەبووی› 🇮🇷 ١. باد ٢. خواهر ٣. هنگام؛ اوان

▣ **وا دای**: بادان؛ بادانی بەن و هەودا 🇮🇷 تاب دادن

**وا کردن**: با کردن؛ ئەستوور بوون؛ پەنەمان؛ ئاوسان 🇮🇷 باد کردن؛ آماسیدن

**وا²**: ئاوەڵناو. وە: ١. باز؛ واز ٢. وەها ‹ماهێکی وایە ساکینی بورجی ویلایەتە/ شاهێکی وایە خاوەنی تاجی ڕەزایە غەوس «بێخود»› 🇮🇷 ١. باز ٢. چنان

▣ **وا بون**: ١. وەها بوون؛ بەم جۆرە بوون ٢. کرانەوە؛ کریانەوە 🇮🇷 ١. چنین بودن ٢. باز شدن

**وا زانین**: وە زانین؛ ئاوا بیر بردن ‹وا مەزانە گۆیژە نزمە چونکە تەبعی عالییە/ نازیری قەسرێکە جێگەی شانشینی والییە «بێکەس»› 🇮🇷 پنداشتن

**وا کردن**: کردنەوە؛ واز کردن 🇮🇷 باز کردن

**پێ وا بون**: بیر و بۆچوون بە چەشنێ بوون؛ ڕوانگە بەو شێوە بوون ‹بۆچی پێت وایە ئەو خودا گەورە/ هێندە بێڕەحمە تۆش بسووتێنێ؟! «هێمن»› 🇮🇷 چنین پنداشتن

**وا³**: ئاوەڵکار. ١. ئاوها؛ وەها؛ بەم جۆرە ‹من لە زیکر و فیکری تۆ غافڵ نەبووم وا تێنەگەی/ حەبس و

تێ‌هەڵدان و زیللەت تۆی لە بیر بردۆتەوە «بێکەس»〉 ٢. ئەوا؛ ئەوەتە 〈مزگێنی دا بە سروە بای بەهاری/ وا هاتەوە نەورۆزی کوردەواری «هەژار، *بۆ کوردستان*»〉 ٣. ئەمێستا؛ هەر ئێسە 〈خۆت بگرە وا هاتم〉 ٤. لێرەوە؛ لەم شوێنەوە 〈ساقیا! وا وەرگەڕێ، وا وەرگەڕێ/ ڕوو لە لای من کە، مەچۆ بۆ سەر پەڕێ «هێمن»〉 ٥. وەها؛ بە جۆرێ 〈وا دەچوو بای پێ نەدەگەیشت!〉 ☰ ١. این‌طور ٢. اینک ٣. هم اکنون ۴. بدین سوی ۵. چنان؛ آنچنان

**وا**[٤]: ئامراز. ١. کە 〈ئەو سلسلە وا موشکی خوتەن نێوی براوە/ پڕپێچوشکەن، خەم‌بەخەم و حەلقەکراوە «کەیفی کوردستانی»〉 ٢. ئاوا؛ ئەها؛ ها؛ بۆ تێگەیاندن 〈وا خەڵکینە ڕاپەڕن!〉 ☰ ١. کە ٢. هان

**وا**[٥]: کار. یە؛ ها؛ پێکهاتەی سێهەم کەسی تاک 〈دایم لە دەرکی سینە بە یادی بڕۆی نیگار/ شمشێری وا بە دەستەوە، وەک پاسەوانە دڵ «بێخود»〉 ☰ هست

- **وا**[٦]: پاشەوشە. پێڕای؛ لەگەڵ 〈دۆخەوا؛ شۆروا〉 ☰ ـ با

- **وا**[٧]: پێشگر. دووبارە؛ باز؛ ـ ئەوە؛ وە ← ئەوا ← نیشانەی کار یان ڕەوتێ کە چەند جارە بێتەوە لە پێش ڕەگی کارەوە دێ 〈واشۆر؛ واکەت؛ واگۆ؛ واگل〉 ☰ وا ← باز-

- **وا**[٨]: پاشگر. کەر؛ ساز 〈نانەوا〉 ☰ ـ وا

**وا**[٩]: نزا. خۆزی؛ خۆزگە؛ بریا؛ شەڵا 〈وا نەدەمردم و ئاوادانی ولاتم دەدیت!〉 ☰ کاشکی؛ ای کاش

**وائیرێن** / wa'îrên/: ☜ **واهار**

**وابزا** / wab(i)za/: ☜ **وەبزانە**

**وابزانە** / wab(i)zane/: ☜ **وەبزانە**

**واپۆک** / wapok/: ئاوەڵناو. ڕەمۆک؛ قوشقی؛ سڵ ☰ رموک؛ گریزپا

**وات**[١] / wat/: ناو. یەکەی پێوانی هێزی کارەبایی کە دەبێتە یەک ژووڵ لە چرکەیەکدا ☰ وات

- **وات**[٢]: پاشگر. پاشگری کۆ بۆ دەستە و جۆر 〈ئاغەوات؛ سەوزەوات〉 ☰ ـ ات؛ علامت جمع

**واتا**[١] / wata/: ناو. مانا؛ واتە 〈ئەم قسە هیچ واتایەکی نییە〉 ☰ معنی؛ مفهوم

⊡ **واتا بوون**: مەعنا هەبوون؛ بە مانا بوون ☰ معنی داشتن

**واتا دان**: مەعنا دان؛ مانای شتێک دان ☰ معنی دادن

**واتا لێکدانەوە**: مانا شی کردنەوە ☰ معنی را شرح دادن

**واتا**[٢]: ئاوەڵکار. ١. واتە؛ واتانێ؛ یانێ 〈واتا، ڕێگا ببڕین بە دەو/ ساڵێک زووتر دوایی دێ شەو «گۆران»〉 ٢. ئایا؛ داخۆ؛ داخوم 〈واتا دەبێ ڕۆژێ منیش ماڵوحاڵێکم هەبێ؟〉 ☰ ١. یعنی ٢. آیا

**واتاناسی** / watanasî/: ناو. *[زمانناسی]* زانستی لێکدانەوە و لێکۆڵینەوە لە واتا و بنەمای وشە ☰ معنی‌شناسی

**واتانێ** / watanê/: ☜ **واتا**[٢]**-١**

**واتایی** / watayî/: ئاوەڵناو. *[ئەدەبی]* مانایی؛ سەر بە ئاوەز و هەست ☰ معنایی

**واتر** / watir/: ئاوەڵکار. ١. بەم جۆرە و پتر ٢. دوورتر 〈واتر بچۆ!〉 ٣. نزیک‌تر 〈واتر وەرە!〉 ☰ ١. چنین و چنان‌تر ٢. دورتر ٣. نزدیکتر

**واترپۆلۆ** / watirpulo/: ناو. یارییەک لە نێوان دوو تیمی مەلەوان لە ناو هەسێڵێکی گەورەدا کە یاریزانان تێدەکۆشن بە دەست تۆپ باوێنە ناو دەروازەی بەرامبەرەوە ☰ واترپولو

**واتش** / watiş/: چاوگ. ئاخافتن؛ قسیە کردن ☰ سخن گفتن

**واتوات** / watwat/: ناو. واتەوات؛ دەنگۆ؛ دەمگۆ 〈مەبۆ بە واتوات دەور زەمانە/ ئەعراب قەبایل لێم مەدەن تانە «خانای قوبادی»〉 ☰ شایعە

**واتووڕی** / wat û w(i)řî/: ☜ **دەنگۆ -١**

**واتۆ** / wato/: ☜ **دەنگۆ ـ۱**

**واتوور** / watûr/: ☜ **دەنگۆ ـ۱**

**واتوورە** / watûre/: ☜ **دەنگۆ ـ۱**

**واتە**[1] / wate/: ناو. ۱. ☜ **واتا** ۲. قسە ‹بە ڕەنگی زەرد و لەشی بێتینت/ بە دەم و واتەی خۆش و شیرینت «بێکەس»› ۳. ☜ **دەنگۆ ـ۱** ☰ ۱. ☜ **واتا** ۲. سخن؛ گفته ۳. ☜ **دەنگۆ ـ۱**

**واتە**[2]: ئاوەڵکار. ۱. کەوابێ ‹واتە بەیانی زوو ڕێ بکەوین تا بۆ نیوەڕۆ بگەین› ۲. واتا؛ دەکاتە؛ یانێ ‹من و تۆ و ئەو، واتە سێ کەس› ☰ ۱. بنابراین ۲. یعنی

**واتەشەک** / wateşek/: ناو. شێرپەنجە؛ کیفژاڵە؛ قرژاڵە؛ سەرەتان ☰ سرطان

**واتەنی**[1] / watenî/: ئاوەڵناو. وتەنی؛ شیاوی گوتن ☰ گفتنی

**واتەنی**[2]: ☜ **وتەنی**

**واتەوات** / watewat/: ☜ **دەنگۆ ـ۱**

**واتەواتە** / watewate/: ☜ **دەنگۆ ـ۱**

**واتەوێرە** / watewîre/: ناو. ۱. بیر و خەیاڵ ۲. شەڕەقسە ☰ ۱. فکر و خیال ۲. جدال لفظی

**واتەی** / watey/: چاوگ. وتن؛ گوتن ‹تۆ خۆ شەرتت کەرد، بەینەتدارەکەم!/ واتت هەر تۆنی تا سەر یارەکەم «سەیدی»› ☰ گفتن

**واتیار** / watyar/: ☜ **وێژەر ـ۱**

**واج**[1] / wac/: ☜ **واچ**[1]

**واج**[2]: پێرۆ. ← **هاجوواج**

**واجا** / waca/: ناو. هێلانە؛ لانە؛ لوونە ☰ آشیانە

**واجب** / wacib/: ئاوەڵناو. واجۆ؛ پێویست ‹ئەی وەتەن! شایانی فەخری، واجبە مەدحت بکەم/ دار و بەردت عەینی گەوهەر، خاک و خۆڵت وەک بلوور «بێکەس»› ☰ واجب

**واجبی** / wac(i)bî/: ناو. واژوی؛ نیرە؛ نوورە؛ نەورە؛ مووخۆر؛ دەرمان؛ دەوایەکی خۆماڵی لە ئاهەک، زەرنیخ و خۆڵەمێش کە وەک هەویر دەیگرنەوە و تووک و مووی لەشی پێ دەسڕێنەوە ☰ واجبی

**واجناسی** / wacnasî/: ☜ **واچناسی**

**واجۆ** / waco/: ☜ **واجب**

**واجە** / wace/: ناو. کوناودیو؛ کولانکە لە دیواردا ☰ روزنە در دیوار

**واجەر** / wacer/: ☜ **واجەرسە**

**واجەرسە** / wacerse/: ئاوەڵناو. واجەر؛ شکاو لە هێلکەدانی مریشکدا (هێلکە) ‹خاکە واجەرسە بوویە› ☰ شکستە (تخم‌مرغ)

**واچ**[1] / waç/: ناو. *[زمانناسی]* واج؛ فۆنیم؛ بچووکترین یەکەی قسە ‹«سەر» و «سیر» هەرکام لە سێ واچ پێکهاتوون› ☰ واج

▪ **واچ**[2]: پاشەوشە. ـ وێژ ‹بەدواچ و بەدگۆ بەدکردارێنمێ/ لایق بە غەزەب دەرگەی نارێنمێ «سەیدی»› ☰ ـ گو

**واچناسی** / waçnasî/: ناو. *[زمانناسی]* فونیمیک؛ واجناسی: ۱. بەشێک لە زمانناسی کە لە سەر واجەکان دەکۆڵێتەوە ۲. پێکهاتەی زمان بە گوێرەی واچەکانی ☰ ۱و۲. واج‌شناسی

**واچە** / waçe/: ☜ **وشە**

**واچیای** / waçyay/: چاوگ. گوتران؛ وتران ☰ گفتە شدن

**واخ**[1] / wax/: ☜ **واغ**

**واخ**[2]: دەنگ. پەک؛ پەکوو؛ بۆ سەیر ☰ وە

**واخ**[3]: پێرۆ. ← **ئاخ و واخ**

**واخت** / waxt/: ☜ **وەخت ـ۱**

**واخوا** / wax(i)wa/: ناو. داواکاری سەرلەنوێ کردنەوە (قسە یا کار) ☰ خواهان تکرار (سخن یا کار)

**واخوێن** / wax(i)wên/: ناو. کەسانێ کە گۆرانی بۆ قامبێژ دەگێڕنەوە ☰ ترجیع‌خوان آواز

**واخێن** / waxên/: ناو. جۆرێ گەمەیە بە گوێز دەکرێ ☰ نوعی گردوبازی

**واد** / wad/: ☜ **وادە ـ۱**

**وادار** / wadar/: ئاوەڵناو. واداشت: ١. ناچار ٢. لێزان؛ پسپۆڕ؛ ئاگادار لە کارێ ≡ ١. وادار ٢. وارد؛ آگاه

⊡ **وادار کردن:** ١. ناچار کردن ٢. خەبەر پێ دان ≡ ١. وادار کردن ٢. آگاه کردن

**وادار کردنەوە:** ١. بیر خستنەوە ٢. وە خەبەر هێنان ≡ ١. یادآوری کردن ٢. آگاه کردن

**وادارتەنە** / wadartene/: چاوگ. ١. هەڵگرتن؛ بەرزەوە کردن ٢. لا بردن ≡ ١. بلند کردن (از زمین) ٢. برداشتن

**واداشت** / wadaşt/: ☜ **وادار**

**وادام** / wadam/: ☜ **بادام**

**وادرۆشە** / wad(i)roşe/: ناو. باوەشێن؛ بارۆشە ≡ بادبزن

**وادە** / wade/: ناو. وادێ؛ وەعدە؛ وەعد: ١. واد؛ بەڵێن؛ گفت؛ سۆز؛ پەیمان ‹وادەیێکت دا بە مەحوی: دیمە سەیری کوشتنت/ وەختی هات ئەو خێرە، سا مەبیە لە بەدگۆ حەرفی پەک! «مەحوی»› ٢. جەنگە؛ هەڕەت؛ وەختی شتێ ‹درەنگ بێ و وادەی بانگیش تێپەڕێ/ با بێ وادەش بێ، ئەبێ بزەڕێ! «پیرەمێرد»› ٣. کات؛ وەخت ‹هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە/ سەرپۆش فڕێ دە! کەی وادەی شەرمە؟ «بێکەس»› ٤. ژوانگە؛ جێژوان ‹وادەمان پای تاقەدار بێ› ٥. کاری بانگ کردن؛ خواستن ≡ ١. پیمان ٢. موسم ٣. وقت ۴. میعادگاه ۵. احضار

⊡ **وادە دان:** بەڵێن دان؛ قەول دان ≡ وعدە دادن؛ قول دادن

**وادە دانان:** وادە دانیان: ١. ژوانگە دیاری کردن ٢. ماوە دیاری کردن ≡ ١. قرار گذاشتن ٢. زمان تعیین کردن

**وادە دانیان:** ☜ **وادە دانان**

**وادە سەنن:** بەڵێن لە کەسێ ساندن بۆ مەبەستێ ≡ قول گرفتن

**وادیارە** / wad(i)yare/: ئاوەڵکار. چما؛ وێدەچێ؛ هەر دەڵێی ≡ انگار

**وادێ**[1] / wadê/: ☜ **وادە**

**وادێ**[2]: ئاوەڵکار. سەردەمێ؛ کاتێ؛ لە کاتێکا؛ ئەو دەم و چاخە ≡ زمانی؛ هنگامی

**وار**[1] / war/: ناو. ١. کوێستان؛ هاوینەهەوار ٢. هەوار؛ وڵات؛ جێگە و شوێن ‹وارا مە› ٣. بار؛ باری سەر پشتی بارەبەر ٤. کاری پارە دان لە جیاتی خەڵک لە چێشتخانە و چاخانە ٥. بەخشش بۆ خاوەن قومارخانە ٦. ئەنوا؛ پەناگا ٧. خوار؛ پێچەوانەی سەر ≡ ١. ییلاق ٢. جای؛ محل ٣. بار ۴. عمل مهمان کردن بقیه در رستوران ۵. انعام به صاحب قمارخانه ۶. پناهگاه ۷. پایین

⊡ **وار ئامەییش:** داخۆزین؛ هاتنە خوار لە سەرەوە ≡ پیادە شدن

**وار بیاییش:** ١. لە بڵندەوە داگەڕان؛ هاتنە خوار لە ژوورەوە ٢. بەعەرزا کەوتن ≡ ١. پیادە شدن ٢. بر زمین افتادن

**وار راکرن:** /کینایە/ زار و زیچی زۆر خستنەوە ≡ بسیار زاد و ولد کردن

**وار**[2]: ئاوەڵناو. ١. خوار؛ خێچ ٢. خواروو؛ ژێروو ≡ ١. کج ٢. پایینی

⊡ **وار کەردش:** داهێنانەوە و خوار کردنەوە ≡ بە پایین کشیدن و خم کردن

**وار**[3]: ئاوەڵکار. خوار ‹کەوتەرە وار› ≡ پایین

**- وار**[4]: پاشگر. ١. دارا؛ خاوەن ‹سزاوار؛ خوێندەوار؛ کۆڵەوار؛ ئومێدەوار› ٢. شوێن؛ جێ ‹شوێنەوار؛ لێرەوار؛ زرێوار› ٣. وەک؛ چۆن ‹بێگانەوار› ≡ ١تا٣. - وار

**واران** / waran/: ناو. باران؛ قاران؛ یاخر؛ یاخەر؛ ئاوێ کە لە ئاسمانەوە بە تنۆکە دێتە خوار ‹بە فەسڵی پایز و بە وەشت و واران/ نیشانەی خەم،

گەلاڕێزانی داران «سەیدی»» 🇮🇷 باران

**وارانن** / waranin/: چاوگ. بارانـدن؛ دابارانـدن؛ داڕژاندن ‹بەرد وارانن؛ نوور وارانن› 🇮🇷 باراندن

**وارای** / waray/: چاوگ. بـارین ‹بـا واران وارۆ› 🇮🇷 باریدن

**واربـای** / warbay/: ئاوەڵـناو. وارِوای؛ پاپـەتی؛ پێخواس؛ پێخاوس 🇮🇷 پابرهنه

**وارخان** / warxan/: ناو. خانووی چەنـدنهۆمی بـێ حەوشە و حەسار 🇮🇷 آپارتمان

**وارد** / ward/: ناو. ١. باڕۆکەی بـە هێلکـەهاتوو ٢. ئامرا؛ ڕەفیقی ڕێگە ٣. کاری بردنەوە لـە قوماردا 🇮🇷 ١. جوجه مُرغی که تازه تخم می‌گذارد ٢. همراه ٣. بُرد در بازی

**وارد** / warid/: ئاوەڵناو. ١. تێگەیشـتوو؛ لێـزان ٢. گەیشتووە بەرەوە لە سەفەر ‹باوکم ئەمڕۆ وارد بوو› 🇮🇷 ١و٢. وارد

**واردش**[١] / wardiş/: چـاوگ. ١. خـوـاردن ٢. قەخوارن؛ خوارنەوە 🇮🇷 ١. خوردن ٢. نوشیدن

**واردش**[٢]: ناو. خواردەمەنی 🇮🇷 خوردنی

**واردن** / wardin/: چاوگ. خواردن 🇮🇷 خوردن

**واردۆخ** / wardox/: ئاوەڵـناو. وەردۆخ؛ خـۆرا؛ فرەخوەر؛ زۆرخۆر 🇮🇷 پُرخور

**وارده** / warde/: نـاو. خواردەمـەنی؛ خـۆراک 🇮🇷 خوراک

**واردەس** / wardes/: ئاوەڵناو. ١. ڕەبەن؛ سەڵـت ٢. بێدەس؛ بێ دەسەلات ٣. گۆشەگیر 🇮🇷 ١. بینوا ٢. زیردست ٣. گوشه‌گیر

**واردەمەنی** / wardemenî/: ناو. خـۆراک؛ خـۆراکی 🇮🇷 خوراک

**واردەی** / wardey/: چـاوگ. خـواردن ‹زەڕێومـا سەرحیسابەن، خاک وە سەرمان!/ نـە پۆشـاک و نـە واردەیما حەلالا «سەیدی»› 🇮🇷 خوردن

**وارز** / wariz/: ☜ وەڕەز

**وارس** / waris/: ناو. واریس؛ میراتگر؛ کەلـەپووڕگر؛ بەشبەری میرات 🇮🇷 وارث

**وارستن** / waristin/: ☜ وارزین

**وارش** / wariş/: ☜ وارشە

**وارشت** / warişt/: نـاو. بارش؛ بارین؛ بارشتی بەفر و باران 🇮🇷 بارش

**وارشە** / warşe/: نـاو. وارش؛ شوورە؛ سـوور؛ دیـوار بە دەوری ماڵ و باغ و بێستاندا 🇮🇷 سور؛ بارو

**وارک** / war(i)k/: ☜ واڕۆک

**وارکۆر** / warkor/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* وارونددا؛ وارِوەنددا؛ بێعەولاد؛ وەجاخکۆر؛ وجاخ‌کوێر 🇮🇷 اُجاق‌کور

**وارکـۆز** / warkoz/: نـاو. زۆم؛ جێگــە لـــەوەڕی تایبەتی هۆبـەی هـەوارچییان 🇮🇷 چراگـاه ویـژەی ییلاقیان

**وارکـەینـا** / warkeyna/: نـاو. کچـی خویشـک؛ خوشکەزای مێوینە 🇮🇷 دخترخواهر

**وارگە** / warge/: نـاو. ١. جێگەی ژیـانی تاوسـانی ‹هاومالان یاوان بە وارگەی جاران/ مـن بـێ بارەبـەر مەندەی هەواران «مەولەوی»› ٢. بارگە؛ بار و بنەی سـەفەر ٣. وڵـکە؛ بـووم؛ هـەرێم 🇮🇷 ١. زیسـتگاه ییلاقی ٢. رخت و بار سفر ٣. اقلیم

**وارگەه** / wargeh/: ناو. هەوارگـە؛ جـێ هـەوار 🇮🇷 زیستگاه ییلاقی

**وارم** / warim/: نـاو. فـەرمایش؛ قسـەی پیـاوی ماقووڵ 🇮🇷 فرموده

**وارمای** / warmay/: چاوگ. فەرموون؛ قسە کردنی پیاوی گەورە 🇮🇷 فرمودن

**وارنای** / warnay/: چاوگ. باراندن 🇮🇷 باراندن

**وارناییش** / warnayîş/: چاوگ. ١. هاتنە خـوار ٢. هێنانە خوار 🇮🇷 ١. فروآمدن ٢. فروآوردن

**وارنیش** / warnîş/: ناو. ١. نهۆمی ژێرین لە خـانوو ٢. کەسێ کە لە کوێستان دەژی 🇮🇷 ١. زیرزمین ٢. کوەنشین

**واروای** / warway/: ☜ **وارباى**

**واروگۆڕ** / war û gor̄/: ☜ **ناڵوگۆڕ**

**واروندا** / warwinda/: ☜ **وارکۆر**

**وار و وێخ** / war û wêx/: ناو. ماڵ و سامان؛ هەموو دارایی ‹لەم شەڕە وار و وێخم چوو!› ≡ تمام ثروت

**وارومندا** / warwenda/: ☜ **وارکۆر**

**وارۆ** / waro/: ☜ **وارۆك**

**وارۆزونادورۆزا** / waroz û naduroza/: ناو/ ئاوەڵکار. پەسرپێرەکە؛ پترپێری؛ بەسرپێر؛ سێ ڕۆژ بەرێ ≡ پس‌پریروز

**وارۆک** / warok/: ☜ **وارۆك**

**وارۆواینە** / warowayne/: چاوگ. فڕێ دان؛ تووڕ هەڵدان ≡ پرت کردن

**وارو** / warû/: ئاوەڵناو. ئاوەژوو ≡ وارونه

**وارە**[1] / ware/: ناو. ١. بارە؛ دەربارە ٢. خوشک؛ خوەیشک ٣. جار؛ چەل ٤. دەستەواو؛ دەستیاو؛ قەرز بە قەرز؛ یارمەتی بە نۆرە ٥. پاژ؛ بەشێ لە چەند بەش ‹لە قەرزەکەم چەند وارەم ماوە› ٦. داهاتی زەمین ≡ ١. بارە؛ زمینه ٢. خواهر ٣. دفعه؛ بار ٤. وام و کمک مُتقابل و نوبتی ٥. جزء؛ قسمت ٦ بهرەی زمین

**ـ وارە**[2]: پاشەوشە. ١. جار؛ چەل ‹دووارە› ٢. بار؛ ـ دێن ‹دەستەوارە› ≡ ١و٢. ـ بارە

**وارەزا** / wareza/: ناو. خوشکەزا؛ خوارزا ≡ خواهرزاده

**وارەسە** / warese/: چاوگ. خەبەر پێ دان ≡ آگاهی دادن

**وارەمسە** / warem(i)se/: چاوگ. ڕەوینەوە؛ ڕەو کردن ≡ وارمیدن

**وارە وارە** / ware ware/: ئاوەڵکار. وردە‌ـوردە؛ کەمەـکەمە ‹قەرزەکانم وارە ـ وارە بار کرد› ≡ بە تدریج؛ کم ـ کم

**ـ واری** / -warî/: پاشگر. ١. چۆن؛ وەک؛ لە گوێن ‹بێگانەواری› ٢. جێگە و شوێن ‹کوردەواری› ≡ ١. ـ واری ٢. ـ سرا

**واریپال** / warîpal/: ناو. وەنەوشەی دەشتەکی؛ گوڵێکە ≡ بنفشەی کوهی

**واریزە** / warîze/: ناو. باوەرێن؛ بارێزە ≡ میوەی باد ریخته

**واریس** / warîs/: ناو. ١. ☜ **وارس** ٢. پاگرە؛ فیلپا؛ واریس؛ نەخۆشی ماسین و گرێوگۆڵ بوونی ڕەگی لەش (شینەدەمار، سوورەدەمار یان ڕەگی لەنفاوی) بەتایبەت لە لاقدا ≡ ١. ☜ **وارس** ٢. واریس

**واریقات** / warîqat/: ناو. بەسەرهات؛ ڕووداو ‹واریقاتەکەم لە سەرەوە تا بن بۆ گێڕاوە› ≡ سرگذشت

**واریل** / warîl/: ناو. بەرمیل؛ بۆشکە؛ دەفری هەراو لە کانزا بۆ تراو تێ‌کردن ≡ بُشکه

**وارین** / warîn/: چاوگ. بارین ≡ باریدن

**وارینش** / warînş/: ئاوەڵناو. پرشنگدار؛ بریقەدار ≡ درخشان

**وارێ** / warê/: ئاوەڵکار. ١. بارێ؛ هەر چۆنێ بێت ٢. چەلێ؛ جارێک ≡ ١. باری؛ به هر حال ٢. یکبار

**وارێن** / warên/: ئاوەڵناو. بارێن؛ بارانداکەر ‹هەورەکە وارێنە› ≡ بارانندە

**وارِای** / war̄ay/: چاوگ. گۆڕین ‹واچە دیم مەویەرد ساتێش وە ساڵێ/ مەوارا هەر دەم حاڵێ وە حاڵێ «مەولەوی»› ≡ تغییر دادن

**وارِتەی** / war̄tey/: چاوگ. گۆڕین ≡ تغییر دادن

**وارِز** / war̄iz/: ☜ **وراز**[1]**ـ١**

**وارِزدن** / war̄izdin/: ☜ **ورازین**

**وارِگ** / war̄(i)g/: ناو. ١. پرمەی گریان ٢. هاوار ≡ ١. هِق‌هِق گریە ٢. فریاد

**وارِن** / war̄in/: ئاوەڵناو. ١. بە چنگ ڕناو (خوری و

کولکه) ٢. بارِن؛ تایبەتمەندی بەفرێ کە با لە جێی خۆی بزاوتووە و لە شوێنێکی تری پەستاوتووە ١. دستچین (پشم) ٢. بادآورده (برف)

**وارۆک** / wařok/: ناو. وارک؛ وارۆ؛ وارۆک؛ بارە؛ بارۆک جوجەی بهاری

**وارە** / waře/: ناو. وارە؛ قەرزداری بدهکاری

**وارەمەنە** / wařemene/: چاوگ. ڕەواندنەوە؛ سڵ دان رمانیدن؛ رم دادن

**وارِیای** / wařyay/: چاوگ. گۆڕدران؛ گۆڕیان تغییر یافتن

**وارێزە** / wařêze/: ناو. پاداری؛ باوەڕێن پادرختی

**واز**[1] / waz/: ناو. ١. ئیشتیا و ئارەزوو ‹بێزیان لە بزە هەڵدەستێ/ وازیان لە خوێن و زووخاوە «هێمن»› ٢. کەیفخۆشی؛ خۆشحاڵی ‹دوێنێ لەسەر واز بوو؛ ئەمڕۆ وازی نییە› ٣. باز؛ قەڵباز؛ چلاپە ٤. چزیرگەی پچووکی لە خیز لە ناو ڕووباردا ٥. وەعز؛ ئامۆژگاری دینی ‹مەلا واز ئەخوێنێ› ١. اشتها؛ میل ٢. خوشحالی ٣. پرش ۴. جزیره‌ی کوچک ماسه‌ای در وسط رودخانه ۵. وعظ

▣ **واز دادان/ دان:** ئامۆژگاری ئایینی کردن وعظ گفتن

**واز لە شتێ/ کەسێک بوون:** حەز لێ کردن؛ خۆش لێ هاتن اشتیاق داشتن به کسی/ چیزی

**واز لێ هاوردن:** ☜ **واز لێ‌هێنان**

**واز لێ هێنان:** واز لێ هاوردن؛ دەست لێ هەڵگرتن؛ خۆ تێ نەگەیاندن ‹بۆ مەرامی خۆت ملم ئەکێشی/ کە ئیشت نەما وازم لێ دێنی! «بێکەس»› دست کشیدن/ برداشتن

**واز هێنان/ هاوردن/ هانین/ ئانین/ ئینان:** دەست هەڵگرتن ‹بەرز و شیرین دار شێلانە، بایز بچۆ ئاو بێرانە! خواداو بچۆ نان بێرانە! مەحموو ئیتر واز بێرانە! «مەتەڵی منداڵان»› دست برداشتن

**واز**[2]: ئاوەڵناو. ئاواڵە ‹درگا وازە؛ ئەم گرییە واز کە!› باز

**واز**[3]: ئاوەڵکار. دیسان؛ باز دوباره؛ باز

**واز**[4]: ئامراز. ئامرا؛ لەگەڵ ‹واز تۆ دێمە شار› با؛ همراه

**ـ واز**[5]: پاشەوشە. ١. ـ خواز ‹جیایی‌واز› ٢. ـ باز؛ خوازیار؛ خوو پێ‌گرتوو ‹قومارواز؛ مەکرواز› ٣. ـ باز؛ بەخت‌کەر ‹سەرواز› ٤. ـ باز؛ کار و پیشە ‹کۆترواز› ٥. کار ‹جیاواز› ٦. ـ باز؛ ـ گرتوو ‹پێشواز› ١. ـ خواه؛ ـ گرا ٢تا۴. ـ باز ۵. ـ گانه ۶. ـ واز

**وازار** / wazař/: ☜ **بازار**

**وازاری** / wazařî/: ☜ **بازاری**

**وازاو** / wazaw/: ناو. پاشاو؛ واژاو؛ ئاوێ کە بە خۆڕایی لە بەر ئاوداشتن یان لە حەوز دەڕوا پساب آبیاری یا لبریز از حوض

**وازبینی** / wazbênî/: ناو. خوازبێنی؛ خوازگێنی خواستگاری

**وازتن** / waztin/: چاوگ. ویستن؛ خواستن خواستن

**وازح** / waziĥ/: ئاوەڵناو. ڕوون؛ خویا؛ ئاشکرا آشکار؛ واضح

**وازر** / wazir/: ئاوەڵناو. وازڕ: ١. وازرە؛ بازرە؛ تەرە ٢. گوێ‌قوڵاخ؛ لەسەرهەست ١. ترسیده ٢. گوش‌بەزنگ

**وازره** / waz(i)re/: ☜ **وازر ـ ١**

**وازرین** / waz(i)rîn/: ☜ **وازلین**

**وازڕ** / waziř/: ☜ **وازر**

**ـ وازکەر** / wazker/: پاشەوشە. بەستراو کەرەوە ‹گرێ‌وازکەر› ـ گشا

**وازگۆ** / wazgo/: ☜ **واگۆ**

**وازلین** / waz(i)lîn/: ناو. وازرین؛ ڕۆنێکی خەست لە تێکەڵاوی چەند هیدرۆکەربونی دەستەی پارافین کە هەتوانی جۆراوجۆری لێ دروست دەکەن وازلین

**وازن** / wazin/: ناو. تازە خونچە ☲ غُنچەی نودمیدە

**وازوازی**[1] / wazwazî/: ناو. هەوەڵ گریانی زارۆک ☲ نخستین گریەی نوزاد

**وازوازی**[2]: ☜ **وازیوازی**

**وازوو** / wazû/: ناوەڵکار. وەزوو؛ وازی؛ بەم زوانە ☲ بە این زودی

**وازە**[1] / waze/: ناو. زیپکەی ڕووی زارۆ ☲ جوش چهرەی کودک

**وازە**[2]: ناوەڵناو. بازە؛ بازگ؛ بازی؛ بەڵەک ☲ خلنگ

**وازەنی** / wazenî/: ناو. هەتوان ☲ مرهم

**وازی**[1] / wazî/: ناو. بازی؛ یاری؛ کایە ☲ بازی

**وازی**[2]: ☜ **وازوو**

**ـ وازی**[3]: پاشەوشە. ١. ـ خوازی ‹ژن و ژنوازی› ٢. ـ بازی؛ بەختکەری ‹سەروازی› ٣. کاری ‹جیاوازی› ٤. خووپێگرتوویی ‹قومارو ازی› ☲ ١. ـ خواهی ٢. ـ بازی ٣. ـ گانە ٤. ـ بازی

**وازیوازی** / wazîwazî/: ناوەڵناو. عەنتەرمەزاج؛ وازوازی؛ هەر دەم لە سەر مەزاجێک ☲ دمدمی

**واژ**[1] / waj/: ناو. ڕەوتی وە بەران هاتنی مەڕ ☲ جفتخواهی میش

**واژ**[2]: ناوەڵناو. واروو؛ ئاوەژوو؛ پێچەوانە ☲ وارونە

**واژ**[3]: پێرۆ. ← **هاژ و واژ**

**واژاو** / wajaw/: ناو. ١. ☜ **وازاو** ٢. ئاودێری شیناوەرد پاش هەوەڵ ئاو ☲ ١. ☜ **وازاو** ٢. آبیاری مزرعە پس از نخستین آبیاری

**واژوی** / waj(i)wî/: ☜ **واجبی**

**واژۆ**[1] / wajo/: ناو. ئیمزا؛ ناو یا دروشمێکی تایبەتی، نیشانی پێناسەی کەسێک کە زۆرتر بۆ وەرگرتن و پەسند کردنی نووسراوەیەک بە کار دێ ☲ امضا

**واژۆ**[2]: ناوەڵناو. پێویست؛ واجب ☲ لازم؛ واجب

**واژوون** / wajûn/: ناوەڵناو. ئاوەژوو؛ واژوونە؛ سەرەونخوون ‹خەرامت چوویە باغ و سەروی بەربادی خەجالەت دا/ گوڵی هەر وەک درک ئالاونە داوێنی واژوونت «مەحوی»› ☲ واژگون

**واژوونە** / wajûne/: ☜ **واژوون**

**واژە** / waje/: ☜ **وشە**

**واژەن** / wajen/: ناو. پەنکە ☲ پنکە

**واژی** / wajî/: ناوەڵناو. ئاوەژوو ☲ وارونە

**واژین** / wajîn/: ناو. ١. نووسراوە ٢. پەخشان ☲ ١. نوشتە ٢. نثر

**واس**[1] / was/: ناو. خەبەر؛ باس؛ هەواڵ ‹هەواسە! لە دیوەخان چ واسە؟› ☲ خبر

**ـ واس**[2]: ☜ **ـ خواز**

**واسار** / wasar/: ناو. وەسار؛ بەهار؛ وەهار؛ یەکەم کژی ساڵ ☲ بهار

**واستش** / wastiş/: چاوگ. ئارەزوو لێ بوون ☲ خواستن

**واستن** / wastin/: چاوگ. واستە؛ خواستن؛ ویستن؛ وازتن ☲ خواستن

**واستە**[1] / waste/: ☜ **واستن**

**واستە**[2]: ناو. شناس؛ ئاشنا و ڕۆشنا؛ پارتی ☲ واسطە

**واستە**[3]: ناوەڵناو. خوازراو؛ داوا کراو ☲ خواستە شدە

**واستەن** / wasten/: ناوەڵناو. واستەنە؛ دڵخواز؛ خواستەمەنی ☲ دلخواە

**واستەنە** / wastene/: ☜ **واستەن**

**واستەی** / wastey/: چاوگ. خواستن؛ ویستن ‹واچە یە غولام ڕەنج بەردەت کیاست/ جە داخت پەی مەرگ دەستووریٚ مەواست «میرزا ئیبراهیم»› ☲ خواستن

**واسڵ** / wasił/: ناوەڵناو. گەیشتووی قەرز و دیاری ☲ واصل شدە

**واسواس** / waswas/: ☜ **وەسواس**

**واسە** / wase/: ناو. پاس؛ ئێشک ☲ پاس؛ نگهبانی

▣ **واسە گرتن**: ئێشک گرتن ☲ پاسداری کردن

**واسەر** / waser/: ناو. ئەسپەک؛ نەخۆشییەکە ☲

بیماری سرسام

**واسەی** / wasey/: چاوگ. خواستن ■ خواستن

**واسیتە** / wasîte/: ناو. ١. هۆ؛ سەبەب ‹کوردە تا کەی بێخەبەر بی؟ نووستنت بێعارییە/ واسیتەی دواکەفتنت ئەمڕۆکە هەر بێکارییە «بێکەس»› ٢. شناس؛ واستە ■ ١. انگیزه ٢. پارتی

**واسیە** / was(i)ye/: ناو. واستە؛ داژدار؛ پارتی ■ پارتی

**واش**[1] / waş/: ناو. بەراز؛ خوو؛ خووگ ■ خوک

**واش**[2]: ناوەڵناو. وەش؛ ساق؛ ساغ ■ سالم

**ـ واش**[3]: پاشەوشە. ـ باو؛ ـ ئاماڵ؛ شێوە ‹سپیواش› ■ ـ فام

**واش**[4]: پێرۆ. ← **شاش و واش**

**واشاڕ** / waşař/: ☜ **واشەر**

**واشتا** / waşta/: ناو. واشتە؛ گراوی؛ دۆستی مێوینە ■ معشوقه

**واشتش**[1] / waştiş/: چاوگ. خواستن ■ خواستن

**واشتش**[2]: ناو. واز؛ ئیشتیا ■ اشتها

**واشتە** / waşte/: ☜ **واشتا**

**واشتەنە** / waştene/: چاوگ. واز لێ بوون؛ خۆش لێ هاتن ■ علاقه داشتن

**واشنە** / waş(i)ne/: ☜ **واشەنە**

**واشۆر** / waşor/: ناو. جلکی ئاڵوگۆڕ؛ جلکێ کە بە خاوێنی هەڵدەگیرێ ■ واشور

**واشە** / waşe/: ناو. ١. باڵندەیەکی ڕاوچی لە خێزانی بازەکان و لە تۆرەمەی هەڵۆیە، بە درێژایی نزیک ٢٧ تا ٣٧ سانتیمیتر، بە باڵی کورت و خڕ و کلکی درێژەوە کە لە شوێنی لێڕەوار و دارستاندا دەژی ٢. تفاقی ئاژەڵ ■ ١. باشه؛ قرقی ٢. علوفەی حیوانات

**واشەر** / waşer/: ناو. واشێر؛ بەرپێچ؛ واشاڕ؛ ئالقەیەکی تەخت و تەنکە دەخرێتە نێوان پێچ و مۆرەوە بۆ کپ بوون، ئاو نەدان یان نەکرانەوە ■ واشر

**واشەمەک** / waşemek/: ناو. باوەشێن؛ بارۆشە ■ بادبزن

**واشەنە** / waşene/: ناو. سروە؛ شنە؛ واشنە؛ وامیە ■ نسیم

**واشی** / waşî/: ناو. ساقی؛ لەشساغی ■ سلامت

**واشێر** / waşêr/: ☜ **واشەر**

**واشێرە** / waşêre/: ناو. تۆمی گیای کاڕووش؛ بەری گیایەکە لە هەرزن دەکا ■ ثمر گیاهی شبیه ارزن

**واشێڵە** / waşêłe/: ناو. گیایەکی لاسک ناسکی گەڵاوردە ■ گیاهی است

**واعیز** / wa'îz/: ناو. ئامۆژیار؛ ئامۆژگاریدەر؛ مۆچیاریکەر ‹ئەشکەوتی بایەکە دەمی واعیز کە دێتە وەعز/ وەقتی سوکووتی نەقشی سمێڵی لە قوو دەکا! «مەحوی»› ■ واعظ

**واغ** / wağ/: ناو. واخ؛ گوێز لە گەمەی گوێزێندا ■ نام گردو در گردوبازی

**واغێن** / wağên/: ناو. گوێزێن ■ گردوبازی

**واف** / waf/: ناو. بولبول؛ بلبل ■ بلبل

**وافوور** / wafûr/: ناو. ١. بافوور؛ ئامرازی تریاک کێشان، بریتی لە لوولەیەکی چێوی کورت کە لکاوەتە پیالەیەکی زارتەنگی زۆر چکۆلەوە ٢. /کینایە/ تریاک؛ تلیاک؛ شیلەی خاشخاش ■ ١. وافور ٢. تریاک

**واق**[1] / waq/: ناو. شینەشاهۆ؛ شیرینشاهۆ؛ شاڤەشین؛ شاڤاشین؛ مەلوو؛ باڵندەیەکی ڕاوچی لە تۆرەمەی شاوەیە، نزیک ٧٥ سانتیمیتر دەبێ، ڕەنگی قاوەیی پڕ خەت و خاڵە، لاقی شین و گەورەیە، زۆربەی ژیانی تەنیایە و خۆ نەدیو دەکا، بەیانانی زوو یان تاوپەڕی ئێواران دەست دەکا بە گەڕان و ڕاو، ناوەکەی لە دەنگیەوە هاتووە ■ بوتیمار

**واق**[2]: ناوەڵناو. ١. مەیماق؛ سەرمەند؛ مات ٢.

بەتاڵ؛ بەوش؛ خاڵی ‹خۆم ئاسا خەیلێن وەتەن مەیخانەم/ چوون پیاڵەی واق شیشەی پەیمانەم «مەولەوی»› ﷼ ١. مبهوت ٢. خالی

▣ **واق بردنەوە** سەرسوورمان ‹کابرا کە هیچ کەس هەرگیز لە چوار شایی پتری نەدابوویە، لەو حاتەمییەم واقی بردەوە «هەژار، چێشتی مجێور»› ﷼ تعجُّب کردن

**واق پەڕین** بێهۆش بوون لە ترسان ﷼ از ترس بیهوش شدن

**واق وڕ بوون** گێژ و مەنگ بوون ﷼ گیج شدن؛ مُتحیر شدن

**واق وڕ مان** واق وڕ بوون؛ واق بردنەوە ‹هاتە هۆش خۆی، واقی وڕ ما/ وتی: یاران چیم لێ قەوما؟ «پیرەمێرد»› ﷼ مُتحیِّر ماندن

**واق**[٢]: دەنگەناو. ١. زیقەی گیانەوەری وەک کەروێشک و ڕێوی لە بەر ئازار ٢. تریقە یان زیقەی مناڵ ﷼ ١. نالەی برخی حیوان ٢. صدای خندە یا گریەی نوزاد

**واقاندن** / waqandin/: چاوگ. واقانن؛ واقنای؛ ویقاندن؛ نالینی گیانەوەری وەک ڕێوی یان کەروێشک لەبەر ئێش ﷼ جیغ و داد کردن برخی حیوانات

**واقانن** / waqanin/: ☜ **واقاندن**

**واقاییش** / waqayîş/: چاوگ. زیقاندن؛ قیژاندن؛ قیراندن ﷼ جیغ کشیدن

**واقنای** / waqnay/: ☜ **واقاندن**

**واقواق**[١] / waqwaq/: ناو. ١. واک؛ ماسیگرەی سپی ٢. دوڕگەیەکی خەیاڵییە ‹لەوێ وەک پەری جەزیرەی واقواق/ چونکە تاقانەی دانیشە بە تاق! «پیرەمێرد»› ﷼ ١. مرغ ماهیخوار سفید ٢. جزیرەای خیالی

**واقواق**[٢]: دەنگەناو. ناڵەناڵی گیانەوەری وەک ڕێوی و کەروێشک ﷼ نالەی پیاپی برخی حیوانات

**واقواقکەرە** / waqwaqkere/: ناو. شاوەشینە؛ خەمخۆرە ﷼ اگرت ساحلی

**واقوڕ** / waqwiř/: ئاوەڵناو. سەرلێشێواو؛ مات و گێژ ﷼ مات و مبهوت

**واقوڕماو** / waqwiřmaw/: ئاوەڵناو. واقوڕ؛ گێژ و مات داماو؛ بە چڕ و چاوی شێواو و سەرسام لە بەر کێشەیەکی زەینی یان ڕووداوێکی ڕەچاو نەکراوەوە ﷼ سراسیمە

**واقوڕی** / waqw(i)ři/: ناو. گێژی و سەرلێشێواوی ﷼ تحیُّر؛ بهتزدگی

**واقوویق** / waq û wîq/: دەنگەناو. زاق و زیق؛ چەقە و هەرای زارۆکان ﷼ جیغ و فریاد بچەها

**واقۆ** / waqo/: ناو. باقۆ؛ نەقە؛ جۆرێ ماسی ﷼ نوعی ماهی

**واقە** / waqe/: دەنگەناو. ویق؛ ویقە؛ دەنگی ناڵەی گیانەوەری وەک ڕێوی و کەروێشک مەیموون و ... ‹لە واقەی مەیموون خەڵک گرد بوونەوە/ چوونە پێشەوە، لێی ورد بوونەوە «پیرەمێرد»› ﷼ صدای نالەی بعضی حیوانات

**واقەکەر** / waqeker/: ناو. *[کینایە]* مالاتی ماڵی ‹واقەکەر لە ماڵما نییە› ﷼ احشام

**واقەواق** / waqewaq/: دەنگەناو. ١. دەنگی لە شوێن یەکی ناڵەی ڕێوی و کەروێشک و ... ‹هەر واقەواقی دڵمە بە دەستی فیراقەوە/ وەک ڕێویێ کە هەر دوو گونی بێ بە فاقەوە! «شێخ ڕەزا»› ٢. *[کینایە]* زیقەزیقی زارۆک ﷼ ١. نالەی پیاپی حیوان ٢. جیغ و داد بچە

**واقی** / waqî/: ناو. قیرە؛ قیژە؛ زیقە ﷼ جیغ

**واقین** / waqîn/: چاوگ. ناڵاندنی ڕێوی و کەروێشک ﷼ نالیدن روباە و خرگوش

**واک** / wak/: ناو. ١. ☜ **واقواق**[١]ـــ١ ٢. شت؛ چت؛ تشت؛ هین؛ هەرامە؛ وانێک؛ وشەیەکە لە جێ ناوێک و زۆر جار بە زیادە دەگوترێ ﷼ ١.

☜ **واق‌واق**[1]ـ١ ٢. چیز

**واکس / waks/**: ناو. بۆیاخ؛ بۆیاغ؛ سواخ؛ سبووق؛ ڕۆنێکی خەستی بریقەدار (و ڕەنگی) بۆ بریقە پێ‌خستنی کەوش و کەل‌وپەلی چەرمی ☲ واکس

⊡ **واکس دان/ کردن** بۆیاخ دان؛ ساوینی واکس بە پێلاودا ☲ واکس زدن

**واکسەن / waksen/**: ☜ **واکسین**

**واکسی / waksî/**: ناو. بۆیەچی؛ بۆیاغچی؛ کەوش بۆیاخ‌کەر ‹واکسی سەر کۆلانی ئێمە بوو› ☲ واکسی

**واکسیل / waksîl/**: ناو. پەلکە قەیتانی سەرشانی چەکداران ☲ واکسیل

**واکسین / waksîn/**: ناو. واکسەن؛ هەوێنێ لە میکروبی نیوەگیانی پەتایێ کە بۆ بەرگری لە تووشیار بوون، دەیخۆنەوە یان دەیوەشێنن ☲ واکسن

**واکسیناسیۆن / waksînasyon/**: ناو. کوتان؛ پەترمە؛ کاری تێرۆکردنی واکسین بۆ ناو لەش ☲ واکسیناسیون

**واکفت / wakift/**: ☜ **واکەت**

**واکلو / wak(i)lû/**: ناو. برا و خۆشکی بە قسە و هەر سەرزارەکی ☲ خواهر و برادر لفظی

**واکمەن / wakmen/**: ناو. ناوی بازرگانی بۆ کەرەسەی چکۆلەی بلاوکەرەوەی دەنگ ☲ واکمن

**واکەت / waket/**: ناو. واکفت؛ ڕەوتی گەڕانەوەی نەخۆشی ☲ عودت بیماری

**واکەر / waker/**: ئاوەڵناو. ١. وازکەر ٢. شتێ کە مرۆ بای پێ دەکا ☲ ١. گُشاینده ٢. نفخ‌آور

**واکینۆ / wakîno/**: ئاوەڵکار. ئاوەها؛ ئابەم جۆرە ☲ این‌طور

**واگژە / wag(i)je/**: ناو. گژەبا ☲ تُندباد

**واگل / wagil/**: ناو. ڕەوتی گەڕانەوە ☲ بازگشت

**واگون / wagun/**: ناو. هەرکام لە ئۆدەکانی قەتار کە بە لوکومۆتیڤ یان ئۆدەی‌ترەوە بەستراوە ☲ واگن

**واگۆ / wago/**: ناو. وازگۆ؛ واوێژ؛ کار و ڕەوتی گێڕانەوەی قسە؛ دووپاتە کردنەوە ☲ بازگویی

**واگە / wage/**: ئاوەڵکار. ئەوێ؛ ئەوێنە؛ ئەینە ☲ آنجا

**واگیر**[1] **/ wagîr/**: ناو. داگیر؛ کار و ڕەوتی بە زۆر سەندن ☲ غصب

**واگیر**[2]: ئاوەڵناو. گیرۆ ‹نەخۆشییەکی واگیرە، وریای خۆتان بن› ☲ واگیردار

**واگیژە / wagîje/**: ناو. گێژەڵووکە؛ گێژەبا ☲ گردباد

**وال / wal/**: ئاوەڵناو. واڵ؛ گوشاد و پەل ☲ فراخ و کم عُمق

**والا / wala/**: ئاوەڵناو. ئاواڵە ☲ باز؛ مفتوح

**والە / wale/**: نزا. بە خوا قەسەم؛ سوێند بە خودا ☲ به خدا قسم

**والەرین / walerîn/**: ناو. ١. سوورەچنار؛ چناری جەوهەردار ٢. گیاکتکە؛ سمڵەتیف ☲ ١. نوعی چنار ٢. سُنبل‌الطیب

**والی / walî/**: ناو. حاکمی ولات ‹کوا والیی سەنەندەج؟ بەگزادەیی ڕەواندز؟/ کوا حاکمان بابان؟ میری جزیروبۆتان؟ «حاجی قادر»› ☲ والی

**والیباڵ / walîbał/**: ناو. یارییەکی دوو تیمی بە تۆپێک و تۆڕێک لە ناوەڕاستدا، تۆپەکە بۆ زەوینی یەک دەخەن و نابێ بهێڵن لە زەوی خۆیان بکەوێ ☲ والیبال

**والیباڵیست / walîbałîst/**: ناو. یاریکەری والیباڵ ☲ والیبالیست

**والی‌نشین / walîn(i)şîn/**: ناو. شارێ کە والی لێ دائەنیشێ ☲ مرکز ولایت

**والێستن / walêstin/**: چاوگ. لێستنەوە ☲ لیسیدن

**واڵ**[1] **/ wał/**: ناو. ١. لێچەک؛ توول؛ جۆرێ

پارچەی ناسکی شاش کە ئەو دیوی لێوە دیارە ٢. گەورەترین گیانداری زەوی کە گوانداریکی ئاوژییە و لە ماسی دەچێ، گۆشتی دەخۆن و ڕۆنەکەشی بۆ دەرمان بە کار دێنن ⊠ ١و٢. وال

**واڵ٢**: ئاوەڵناو. وال؛ پان و بلاو و پەل ⊠ فراخ و کم عُمق

**واڵا١** / wała/: ناو. ١. جلەبووکی کچۆلان ٢. پارچەی تەنک و شاش ‹یەکایەک دارتوان پۆشان بە سەد دەرد/ لیباسی دەردی خەم: واڵای تەمام زەرد «سەیدی»› ٣. شرۆڤە؛ ڕاژە؛ ڕاوە؛ کاری واتا شی کردنەوە ⊠ ١. لباس عروس دختربچە ٢. توری ٣. شرح و تفسیر

⊡ **واڵا کردن**: ڕاوە/ ڕاژە کردن؛ شی کردنەوە ⊠ شرح و تفسیر کردن

**واڵا٢**: ئاوەڵناو. ١. ئاواڵە ‹گوڵاڵە ئاڵای ئاڵا و واڵای خۆی/ بووە بە لەکەی داخی دەروون بۆی «پیرەمێرد»› ٢. بەتاڵ و بێناوەرۆک ⊠ ١. باز ٢. تهی

**واڵا٣**: پێرۆ. ← **ناڵوواڵا**

**واڵابێژ** / wałabêj/: ناو. ١. واڵاوێت؛ دابێژراو بە پارچەی تەنک ٢. شیرپاڵۆ؛ پارچەی تەنکی شت پێ دابێژان ⊠ ١. بیختە با پارچە ٢. پارچەی بیزن

**واڵامەن** / wałamen/: ناو. جۆرێ زیپکەی پێست ⊠ نوعی جوش پوست

**واڵان** / wałan/: ناو. سەرپەردە؛ کوڵەپەردەیەکی جوان کە بە سەر پەردەدا هەڵیدەواسن ⊠ والان

**واڵاوێت** / waławêt/: ☜ **واڵابێژ-١**

**واڵایی** / wałayî/: ناو. بۆشایی؛ بەتاڵایی ⊠ خلأ

**واڵنای** / wałnay/: چاوگ. داچڵەکاندن ⊠ شُکە کردن

**واڵە١** / wałe/: ناو. ١. دۆخی لەقین و خوار سووڕانی تەگەری ماشین و ... ‹تەگەری ئەو ماشینە واڵە دەکا، دەرنەپەڕێ باشە› ٢. ☜ **واڵێ** ⊠ ١. حالت لَنگ زدن چرخ اتومبیل ٢. ☜ **واڵێ**

• **واڵە٢**: پاشەوشە. وارە؛ بەش؛ ئەسپاب؛ پارەیەکی گچکە لە شتێ ‹وردەواڵە؛ ئاسنەواڵە› ⊠ ـ پارە

**واڵەکێ** / wałekê/: ☜ **واڵێ**

**واڵیای** / wałyay/: چاوگ. داچڵەکان ⊠ شُکە شدن

**واڵێ** / wałê/: ناو. واڵە؛ واڵەکێ؛ خوشک ⊠ خواهر

**وام** / wam/: ناو. ١. واو؛ قەر؛ قەرز ٢. بادەم؛ باوی؛ باهیڤ ⊠ ١. وام ٢. بادام

**وامار** / wamar/: ☜ **وامدار**

**واماگ** / wamag/: ئاوەڵناو. داماگ؛ داماو ⊠ واله

**وامدار** / wamdar/: ئاوەڵناو. وامار؛ قەرزدار؛ قەرزار ⊠ بدهکار

**وامداری** / wamdarî/: ناو. قەرزاری؛ قەرزداری ⊠ بدهکاری

**وامی** / wamî/: ناو. بادام؛ باوی؛ باهیڤ ⊠ بادام

**وامینە** / wamîne/: ئاوەڵناو. بادامی ⊠ بادامی

**وامیە** / wam(i)ye/: ناو. سروە؛ شنە ⊠ نسیم

**وامێڵانە** / wamêłane/: ناو. گێژەڵووکە ⊠ گردباد

**وان١** / wan/: جێناو. ئەوان ‹سەرمایەی وان لە گەڕدا بێ/ با زۆر دەرک بە قوڕ گیرێ! «هێمن»› ⊠ آنها

• **وان٢**: پاشگر. ١. ڕاگر؛ چاودێر ‹گاوان؛ باخەوان؛ ئاشەوان› ٢. کارکەر و خووپێگرتوو ‹دەشتەوان› ٣. پارێزەر ‹ڕازەوان؛ ملیوان› ٤. لێزان ‹مەلەوان؛ هەڵبەستوان› ⊠ ١تا٣. ـ بان ٤. ـ وان

**وانا١** / wana/: ئاوەڵناو. ١. خوێندەوار؛ سیوات‌دار ٢. تایبەتمەندی خەتێ کە باش دەخوێندرێتەوە ⊠ ١. باسواد ٢. خوانا

**وانا٢**: جێناو. ئەوان؛ هۆوان ⊠ آنان

**وانادیوم** / wanadyum/: ناو. توخمی کیمیایی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ٢٣ و کێشی ئەتومی ٥٠،٩٤، بە ڕەنگی خۆڵەمێشی کاڵ یان زیوی کە لە ئەسیددا دەتوێتەوە و وەک کاتالیزۆر بە کاری

دێنن ☰ واناذیم

**وانـان** / wanan/: جێناو. ١. یانـە؛ ئـەمان ٢. وانـا؛ ئەوان ☰ ١. اینها ٢. آنها

**وانای** / wanay/: چاوگ. ١. فێر بـوونی خوێنـدن ٢. خوێندن ‹شـەو و ڕۆ مـن جـە دامـان، وەرنـەدام دەست/ بوانام تا جەلاش، هەر چـیم نـە دڵ هەسـت «سەیدی»› ☰ ١. آموختن درس ٢. خواندن

**وانـایوە** / wanaywe/: چـاوگ. خوێندنـەوە ☰ مطالعه کردن

**وانتەی** / wantey/: چاوگ. خوێندن ☰ خواندن

**وانج** / wanc/: ناو. مێژوێ؛ مژوێ؛ نیسک ☰ عدس

**واندن** / wandin/: چاوگ. خوێندن ☰ خواندن

**ـ وانکە** / -wanke/: پاشگر. پـارێزەر و داپۆشـەر ‹ملوانکە؛ بەروانکە› ☰ ـ بند

**وانگا** / wanga/: ئاوەڵکار. ئەوسا؛ ئەوساکە ☰ آنگاه

**وانە**[1] / wane/: ناو. دەرز؛ دەرس ☰ درس

**وانە**[2]: جێناو. ئـەوان؛ ئەوانـە ‹ئـەم کۆشـکە دەبـینی هەشت نهۆمە/ هی وانە حـەوت، یـەکێک بـە خۆمـە **«هەژار، مەم و زین»**› ☰ آنها

**ـ وانە**[3]: پاشگر. کەرتێکی ئامرازساز کـە زۆرتـر بـە مانـای پـارێز و ڕاگـر و داپۆشـە، لـە شـکڵ و شێوازێکی جواندا ‹دەستەوانە؛ لووتەوانە؛ پووزەوانە› ☰ ـ بند

**وانـەک** / wanek/: جێـناو. وانێـک؛ واک؛ هەرامـە؛ ئەوتشت؛ هین ☰ چیز

**وانـەوان** / wanewan/: ئاوەڵـناو. خوێنـدەوار؛ سیوات‌دار ☰ باسواد

**وانـەوێـژ** / wanewêj/: نـاو. هینـدار؛ فێرکـار؛ مامۆستا ☰ آموزگار؛ معلم

**وانەی** / waney/: چاوگ. خوێندن ☰ خواندن

**وانـەیـش** / waneyîş/: چـاوگ. وەخوێنـدن؛ خوێندنەوە ☰ مُطالعه کردن

**وانەیی** / waneyî/: ناو. کلاسیک؛ پێوەندیـدار بـە وانەی فێرگەییەوە ☰ کلاسیک

**وانی** / wanî/: ئاوەڵکار. ئاوها؛ بەم جۆرە ☰ این طور

**وانیار** / wanyar/: ئاوەڵناو. خوەنـەوار؛ خوێنـدەوار ☰ باسواد

**وانیل** / wanîl/: نـاو. ١. گیایـەکی هەڵـچووی ناوچەی ئـەمریکای ناوەنـدی، بـە گـەڵای خـڕی گۆشـتن، گوڵـی سـپی و بـەری بۆنخۆشـەوە ٢. ماکی بۆنخۆشی بلـۆرین لـە تـوێخی بـەری ئـەو گیایە کە بێ‌ڕەنگـە و لـە ئـاودا دەتوێتـەوە و بـۆ بەهارات دەشێ ☰ ١و٢. وانیل

**وانێت** / wanêt/: نـاو. وانێـتبـار؛ ماشـینی بـاری بچووک، بۆ هەڵگرتنی باری کەمتر لە دوو تۆن ☰ وانت

**وانێتبار** / wanêtbar/: ☜ **وانێت**

**وانێک** / wanêk/: جێناو. واک؛ تشت؛ هین؛ شت ☰ چیز

**وانێها** / wanêha/: جێناو. ئەمانە؛ شتانێ لێـرەن ☰ اینها

**واو** / waw/: ناو. ١. ناوی پیتی بیستوهەشـتەمی ئەلفوبێـی زمـانی ٢. قـەرز؛ دەیـن؛ وام ‹بـە واو بمدەیە، دەتدەمەوە› ☰ ١. حرف واو ٢. وام

▣ **واوی دوی عـەمر** (**عمرو**): *[کنایـە]* جووچکـەی کەسـێ؛ کەسـێ کـە هەمیشـە بـە دوای کەسـێکەوەیە و هـیچ تایبەتمەندییـەکی لـە خۆیەوە نییە و بەکەڵکی هیچ نایە (ئاماژەیـە بـە واوی کۆتایی وشەی «عَمرو» کـە ناخوێندرێتـەوە) ☰ آویزان کسی

**واوا**[1] / wawa/: ئاوەڵناو. *[منداڵانـە]* بریندار لە زمـانی منداڵانـەدا ‹چـەچم واوا بـووە› ☰ زخمـی در زبـان کودکان

**واوا**[2]: دەنـگ. بـڤ؛ جـێ مەترسـی لـە زاراوەی منداڵاندا ‹واوا! نەکەی!› ☰ خطر؛ اُف

**واوالێکـراو** / wawalêk(i)raw/: ئاوەڵـناو.

**وشکەبەر** / wişkeber/: ☜ **وشکەبار**

**وشکەبەرد** / wişkeberd/: ☜ **وشکەکەڵەك**

**وشکەبیر** / wişkebîr/: ناو. هیشکەبیر؛ چاڵاوێ کە هەر بەهاران ئاوی تێدایە ■ چاهی کە فقط بهاران آب دارد

**وشکەبیرۆ** / wişkebîro/: ناو. نەخۆشییەکی پێستە ■ از بیماری‌های پوست

**وشکە پڵاو** / wişkep(i)ław/: ناو. ئیشکەپڵاو؛ پڵاوێ کە دەگەڵ لێنان ڕۆنی تێ نەکرێ ■ چلو

**وشکە پـەل** / wişkepel/: نـاو. بـووبیش؛ گیاجـاڕی دێم ■ هرزەگیاه دیم

**وشـکەجاو** / wişkecaw/: ناوەڵـناو. وشـــکەجوو؛ ئیشکەجوو؛ بێ‌پێخۆر ■ بی نانخورش

**وشکەجو** / wişkecû/: ☜ **وشکەجاو**

**وشکەچن** / wişkeçin/: ☜ **وشکەکەڵەك**

**وشکەچۆم** / wişkeçom/: نـاو. ئیشکەچۆم؛ ڕووبارێ کە لە تاوساندا ئیشک دەبێ ■ رود فصلی

**وشکەچین** / wişkeçîn/: ☜ **وشکەکەڵەك**

**وشکەخڕ** / wişkexiř/: نـاو. وشکەشـیو؛ خـڕێ کـە زوو ئاوەکەی وشک دەبێ ■ درەای کـە آبـش زود می‌خشکد

**وشکەخوتەن** / wişkexoten/: ناو. جۆرێک چنـاری خوار و خێچـە کـە ڕاسـت هەڵـناچێ و زۆر بـاڵا ناکات ■ نوعی چنار

**وشکەدار** / wişkedar/: ناو. ١. داری وشک‌هـەڵاتوو ٢. چڕ و چێو ■ ١. چوب خشک شدە ٢. هیزُم

**وشکەدان** / wişkedan/: ناو. دانەوێڵە ■ بُنشن

**وشـــکەداوەت** / wişkedawet/: نـــــاو./پـــــلار/ ئیشکەداوەت؛ هەڵـپەڕکێ پیـاوان کـە ژنی تێـدا نەبێ ■ رقص گروهی مردانە

**وشکەدایەن** / wişkedayen/: ناو. دایەنێ کـە شـیر نادا بە منداڵ و تەنیا پێ ڕادەگا ■ دایەای کە بچە را شیر نمی‌دهد و فقط تروخشک می‌کند

**وشکەدۆ** / wişkedo/: ناوەڵناو. کـۆن‌دۆ؛ ئیشـکەدۆ؛ تایبەتمەندی مانگایێ کە نەزابێ بەڵام شیر بدا ■ ویژگی گاوی کە بچە نیاوردە ولی شیر می‌دهد

**وشکەرۆ** / wişkero/: ☜ **وشکارۆ**

**وشکەڕن** / wişkeřin/: نـاو. ئیشکەڕن: ١. دەسکەنە ٢. کاری تووک ڕنینەوە لە پێست بێ خووساندن ٣. کۆسە؛ مرۆی خۆگۆڕیوی سەر شـانۆ ■ ١. درو غلە با دست ٢. عمل برکندن مـوی از پوسـت بـدون خیساندن ٣. دلقک نمایش

**وشکەڕۆ** / wişkeřo/: ناوەڵناو. ئیشـکەڕۆ؛ هشـکەڕۆ؛ ڕانەهێنراو (ئەسپ) ■ تعلیم‌ندیدە (اسب)

**وشـکەڕێ** / wişkeřê/: نـاو. ئیشـــکەڕێ؛ ڕێگـــای سەخت و بەردەڵان و خۆش‌نەکراو ■ راه سنگلاخ و ناهموار

**وشکەساڵ** / wişkesał/: ناو. ئیشکەساڵ؛ هشکساڵ؛ ڕەشەساڵ؛ ساڵی کەم باران ■ خُشکسال

**وشکەســـاڵی** / wişkesałî/: نـــاو. ئیشکەساڵـــــی؛ هشکساڵی؛ ڕەشەساڵی؛ بێ‌بارانی ■ خُشکسالی

**وشکەسۆفی** / wişkesofî/: ناو./پلار/ ئیشکەسـۆفی؛ تەرکەدنیای نەزان و بێ‌سەلیقە ‹بڕوانە وشکەسۆفی و ڕەقسی بە هەلهەلە/ دیسان لە بەحری وشکی هـەوا کەوتە پێ‌مەلە! «نالی»› ■ صوفی خشک و قشری

**وشکەســەرما** / wişkeserma/: نـاو. ئیشکەســـەرما؛ هشکەساری؛ هشکەسڕ؛ سەرما و بەستەڵەکی بێ باڕژن ■ سرمای سخت بی‌بارش

**وشکەسەما** / wişkesema/: ناو./کینایە/ ئیشکەسەما؛ کاری خۆ زۆر بەکەیف نیشان دان بە خـۆڕایی ■ اظهار شادی بدون سبب

**وشکەسی** / wişkesî/: ناو. ١. سەنگ‌فەرش ‹پـووش بوو بە گیا، چیلکەی باخ بوو بە دار گوڵ/ لە وشکەسی کانی کەوتە قوڵەقوڵ «گۆران»› ٢. ☜ **وشکەمز-١** ■ ١. سنگفرش ٢. ☜ **وشکەمز-١**

**وشـکەشـایی** / wişkeşayî/: نـاو. زەمـاوەنی بـەبێ

خـواردن و خواردنـەوە 🙰 مجلس عروسی بـدون خوردن و آشامیدن

**وشکەشین** / wişkeşîn/: ناو. شیوەن بۆ کەسێ بەبێ ئـەوە خـاوەن‌مـردوو نـان و خـوان بـدا بـە شیوەن‌گێران ‹چووین بۆ ئاغا وشکەشینمان کـرد!› 🙰 شیون بی اطعام

**وشکەشیو** / wişkeşîw/: نـاو. ئیشکەشـیو؛ دۆڵ و دەرەی بێ‌ئاو ‹لەوبەر وشکەشیو گـەڕەکی گـەورە/ مزگەوتێکە و ماڵ لێی داوە دەورە «گۆران»› 🙰 درّەی خُشک

**وشکەقۆخە** / wişkeqoxe/: ☜ **وشکەکۆخە**

**وشکەکۆخە** / wişkekoxe/: نـاو. وشـکەقۆخە؛ کۆخەی وشک و بێ بەڵغەم کە سینگ و گـەروو زۆر ئازار دەدا 🙰 سرفەی خشک

**وشکەکەڵەک** / wişkekełek/: نـاو. وشـکەبەرد؛ ئیشکەبەرد؛ ئیشکەچن؛ وشـکەچن؛ وشـکەچین؛ ئیشکەکەڵەک 🙰 سنگچین بدون ملاط

**وشکەکەند** / wişkekend/: نـاو. ئیشـکەکەند؛ وشکەکێڵ؛ شێوەردێ کە بە وشـکی کێڵـرابێ 🙰 شخم زمین آبیاری نشده

**وشکەگیا** / wişkeg(i)ya/: نـاو. پـەلاش؛ پـیش؛ پووش 🙰 خاشاک

**وشکەڵ** / wişkeł/: ناو. ویشکەڵ؛ لکـی وشـکی دار 🙰 شاخەهای خشک درخت

**وشکەڵاتو** / wişkełatû/: ☜ **وشك‌هەڵاتو**

**وشکەڵوا** / wişkełwa/: ناو. هەلاواوشک؛ هەڵـوای وشک 🙰 حلوای خُشک

**وشکەمز** / wişkemiz/: ناو. وشـکەمس؛ هشـکەمز؛ ئیشکەمز؛ ئیشکەمس؛ حشـکەمز: ١. وشکەسـی ٢. شـوانکارەیی بـێ بـەهرەی شـیر و کولـکەی ساڵانە 🙰 ١. مُزد نقـدی بـدون خـوراک ٢. چوپـانی بدون پرداخت بهرەی سالانە

**وشکەمس** / wişkemis/: ☜ **وشکەمز**

**وشکەوبوگ** / wişkewbûg/: ☜ **وشکەوەبو**

**وشکەوەبو** / wişkewebû/: ئاوەڵناو. وشـکەوبووگ: ١. ئیشکەوەبوو ٢. لەڕ و لاواز 🙰 ١. خشک‌شـدە ٢. لاغرمُردنی

**وشکەوەرد** / wişkewerd/: نـاو. ویشـکەوەرد؛ خەفتان؛ کاری تۆ چاندن لە شـێوەرد بـە تـەمای باران 🙰 بذرافشانی در زمین خشک به امید باران

**وشکەهەڵوا** / wişkehełwa/: ناو. هەڵـوای ئـارد و دۆشاو کە توند دروسـتی دەکـەن بـۆ سـەفەر 🙰 حلوای خشکِ توشەی سفر

**وشکەهەوەڕ** / wişkeheweř/: ئاوەڵـناو. *[کنایـە]* چکووس؛ چرووک؛ ڕژد 🙰 خسیس

**وشکەیی** / wişkeyî/: نـاو. *[کنایـە]* ڕووبـینی و کلکەسووتە 🙰 تملُق

**وشك‌هەڵاتو** / wişkhełatû/: ئاوەڵناو. وشـکەلاتوو: ١. ئیشـکەوەبوو ‹وەکـوو «جـامی» دەڵـێ، دەم وشک‌هەڵاتوو من سـەگێکی گـەڕ/ جگـەر تینـووم و دەخوازم نمێ لەو بەحری ئیحسانە «مـەحوی»› ٢. لەڕ و لاواز کەوتوو 🙰 ١. خشکیدە ٢. بسیار لاغرشدە

**وشکی**[1] / wişkî/: ناو. هشکی؛ وشکی: ١. دۆخ یـان چۆنیـەتی وشـک بـوون ٢. وشـکانی؛ وشـکایی؛ هیشـکانی؛ پشـکانی؛ هیشـکایی؛ ئیشـکایی؛ هشکاتی؛ هیشکاتی؛ خوشـکانی؛ ڕەشـایی؛ بـەژ؛ بەشێک لە ڕووی زەوین کە ئاو دای‌نەگرتووە ‹بـە ئابی تێگەییشتین ئێمە دنیا، هەر سەرابێ بوو/ هەموو دەشچن بە خنکان و لە وشکیشە مەلـەی مـەخلووق! «مەحوی»› 🙰 ١و٢. خشکی

**وشکی**[2]: ئاوەڵـناو. پەتی؛ بێ‌هیچ ‹نانی وشکی بخـۆ!› 🙰 خشک و خالی

**وشم** / wişm/: ناو. بەڵای شیناوەرد 🙰 آفت نباتات

**وشـو** / wiş(i)w/: دەنـگ. وشـەی ترسـاندنی ترسەنۆک 🙰 پخ

**وشۆ** / w(i)şo/: ناو. وۆشۆ؛ جۆرێ وەرزشی شەڕانی

ولاتی چینە، وەکوو کاراتــە، بــە بــەرگی تایبــەتی خۆیەوە 🇮🇷 ووشو

**وشــو / w(i)şû/**: نــاو. وشــی؛ ووووشــی؛ وەشــەی؛ وەشی؛ ویشی: ١. کۆمەڵێ زۆر لە دەنکــی میــوە کە بە دارێکەوە هەڵواسراوە ٢. گوڵی دەخڵ 🇮🇷 ١. خوشەهای از درخت آویزان میوە ٢. خوشەی غلە

**وشوکەر / w(i)şûker/**: ناو. ویشی‌چن؛ ویشی‌کــەر؛ گوڵچن؛ گوڵ‌چین؛ کەســێ کــە دەســک و گــوڵ دەکا 🇮🇷 خوشەچین

**وشە / w(i)şe/**: ناو. واچە؛ واژە؛ وتــە؛ بێــژە؛ گوتــە؛ کوتە؛ ویژە؛ لێمە؛ لێمــا؛ دروشــە: ١. ســەرجەمی چەند پیت کە یەکەیەکیکی ســەربەخۆی مانــادار پێک دێنێ ‹بەلام شیرنترە لەو شەکرەلێوە/ وشــەی کــوردی کــە هەڵــدەڕژێ لــە لێــوم «هــێمن»› ٢. *[زمانناسی]* سێهەمین یەکەی زمان کە لە یەک یان چەند مۆرفیم پێکهاتووە 🇮🇷 ١. کلمە ٢. واژە

**وشەبەوشە / w(i)şebew(i)şe/**: ئاوەڵکار. کەلیمــە بە کەلیمە؛ لەبز بە لەبز 🇮🇷 حرف بە حرف

**وشــەدان / w(i)şedan/**: نــــاو. ١. کتێبێکـــــــی سەربەخۆی جووت‌زمان، بریتی لە وشەی تایبەتی لقێکی زانستی زمانێک بە زمانێکی‌تر ٢. پێڕستی وشە دژوارەکانی کتێبێک لە پاشکۆی کتێبەکەوە ٣. فەرهــەنگی وشــە 🇮🇷 ١و٢. واژەنامــە ٣. فرهنــگ لغت

**وشــەک / w(i)şek/**: نــاو. ورشـــەک؛ وشـــەگ؛ وەرشـــەک؛ وەشـــەک؛ وەشـــەگ؛ هوشـــەک؛ وەرشەق؛ جۆرێ پشیلەکێوی کە کەوڵــی نــەرم و زۆر بەنرخە 🇮🇷 وشق

**وشەگ / w(i)şeg/**: ☜ **وشەك**

**وشەنامە / w(i)şename/**: ناو. فەرهەنگ 🇮🇷 لغتنامە

**وشی / w(i)şî/**: ☜ **وشو**

**وشــیار / wişyar/**: ئاوەڵــناو. ئاگــادار؛ بــەبیر؛ وریــا ‹شوکور وشیارە مــەحوی؛ تــێ‌دەگــا دنیــا خەراباتــە/ خەرابەی گەر بکا ئەهلی خەرابــە بــۆچی لــێ دەگــرم «مەحوی»› 🇮🇷 هوشیار

⊡ **وشیار بــون**: ١. ئاگادار بوون ٢. لە سەر هەست بوون ‹وشیار بە! نەکەوێ بشکێ› 🇮🇷 ١. آگاه بودن ٢. مواظب بودن

**وشیار بوونەوە**: ١. ئاگادار بوونــەوە لــە کــارێ ٢. خەوەر بوونەوە؛ بە خەبەر هاتن لە خــەو ‹لادەم لە سەرم سەرێشی دوێشەو/ وشیار بمەوە لە گێژی و خەم «هەژار، *مەم و زین*»› 🇮🇷 ١. آگــاه شــدن ٢. بیدار شدن از خواب

**وشیار کردنەوە**: ١. ئاگادار کــردن لــە نهــێنی ٢. خەوەر کردنەوە؛ لە خەو ڕاپەڕانــدن 🇮🇷 ١. آگــاە کردن از راز ٢. بیدار کردن از خواب

**وشیاری / wişyarî/**: ناو. ١. وریایی؛ بزێوی ‹دەردی دووری، دەردی دووری کوشتمی/ دەردی وشــیاری و سەبووری کوشتمی «هێمن»› ٢. بەئاگایی؛ بێداری 🇮🇷 ١. هُشیاری ٢. بیداری

**وشیاو / wişyaw/**: ☜ **وەشیاو ـ١**

**وشین[1] / w(i)şîn/**: چاوگ. ١. گوشین؛ گلۆفین ٢. هەڵچۆڕان؛ تکە کردنی ئاوی باران و دلــۆپە و ... 🇮🇷 ١. فشُردن ٢. چکیدن

**وشین[2]**: ئاوەڵناو. ١. پێوەندیدار بە گیاکەنــدرەوە ٢. لە وش چێ‌کراو ‹گۆنی وشین› 🇮🇷 ١. منسوب بــە کَنَف ٢. کَنَفی

**وشــێردن / w(i)şêrdin/**: چـــاوگ. قەشـــــارتن؛ شاردنەوە 🇮🇷 پنهان کردن

**وفە / w(i)fe/**: ناو. کوانێکە لە ئاژەڵ دیت 🇮🇷 دُمــل دامی

**وکێلی / w(i)kêlî/**: ☜ **وەکیلەی**

**ول[1] / wil/**: نــاو. ١. پنچکە دڕکێکە لە شیلان ئەکا، گوڵی زەرد و سوور دەگرێ ٢. گولیک؛ گلــووک؛ گول ٣. خونچە 🇮🇷 ١. خاربُنی شبیە نسترن کوهی ٢. گُل ٣. غُنچە

**ول**[۲]: ئاوەڵناو. ۱. بێدەنگ ‹ول بە!› ۲. وڵ؛ بەرەڵا ‹ولی کە با بچوود› ▤ ۱. ساکت ۲. وِل

◘ **ول کرن**: ۱. دەرکردن ۲. بەرەڵا کردن ▤ ۱. راندن ۲. وِل کردن

**ول**[۳]: پێترۆ. ← **شلوول**

**ولا**[۱] / w(i)la/: ئاوەڵکار. ئەولا؛ ئەوئالی ▤ آن‌سو

**ولا**[۲]: ☜ **وەلا**[۲]

**ولحێ** / wilĥê/: ☜ **ولحێ**

**ولفەت** / wilfet/: ☜ **وەڵیفەتانە**

**ولکری** / wilk(i)rî/: ئاوەڵناو. ۱. دەرکراو ۲. بەرەڵداکراو ▤ ۱. رانده شده ۲. رهاشده

**ول ـ ول** / wilwil/: ناو. دەربڕینی نارەزایەتی بە گوڕە و هەراوە ▤ اعتراض و داد و بیداد

**ولۆ** / w(i)lo/: ☜ **ولێ**

**وله** / w(i)le/: ئاوەڵناو. پان؛ بەرپان ▤ پهن

**ولەتسە** / w(i)let(i)se/: ناو. جۆرێ ولی پچووک بە گولی کاڵ و ئاماڵ بنەوشەوە ▤ نوعی نسترن

**ولەتووت** / w(i)letût/: ناو. نەستەرەن؛ شیلان؛ گولەشیلان؛ دلێق ▤ نسترن

**ولەتووتی** / w(i)letûtî/: ☜ **ولەسەگانە**

**ولەرە** / w(i)lere/: ناو. ولیرە؛ ولێرە؛ پۆلکە؛ گاگۆز ▤ خلر

**ولەزەرد** / w(i)lezerd/: ناو. گولەزەردە ▤ گُل زرد

**ولەسەگانە** / w(i)lesegane/: ناو. ولەتووتی؛ شیلان؛ جلێق ▤ نسترن کوهی

**ولەگوڵاوی** / w(i)leguławî/: ناو. نەسرین؛ گولەچیا؛ گولەبەرامە ▤ نسرین

**ولی** / w(i)lî/: ناو. ۱. گولباخ؛ گولەباخ؛ گولباخی ۲. خونچە؛ بشکووژ ۳. گوڵ ▤ ۱. گُلِ گُلاب ۲. غُنچە ۳. گُل

**ولیرە** / w(i)lîre/: ناو. ۱. کزن؛ زنگزاوا؛ جیدانە ۲. ☜ **ولەرە** ▤ ۱. گاودانە ۲. ☜ **ولەرە**

**ولێ** / w(i)lê/: ئاوەڵکار. ولۆ؛ ئەم‌جۆرە ▤ این طور

**ولێرە** / w(i)lêre/: ☜ **ولەرە**

**وڵ**[۱] / wił/: ناو. ۱. کون؛ قول؛ کونا ۲. ورکەنانی تێگوشین ▤ ۱. سوراخ ۲. خُردەنان ترید

**وڵ**[۲]: ئاوەڵناو. ۱. وێڵ؛ بەرەڵا ۲. گلۆفاو؛ لە ناودەستا گوشراو ۳. بزر؛ گوم ▤ ۱. وِل ۲. مُچالە ۳. گُم

◘ **وڵ کردن**: ۱. بەردان ۲. دەستبەردار بوون لە شت، کەس یان بابەتێک ▤ ۱و۲. وِل کردن

**وڵات** / w(i)łat/: ناو. وەلات؛ وەڵات: ۱. سەرزەمینی جێژیانی خەڵک ‹بەڵام ئەی کوردستانەکەم!/ وڵات نییە هەرگیز لە تۆ خۆشەویستتر «شێرکۆ»› ۲. مەملەکەت ‹وڵاتانی سکاندیناوی› ۳. *[مەجاز]* دەوروبەر و دار و دیوار ‹هەموو وڵاتی پیس کرد؛ بە سەر وڵاتیدا مەڕێژە!› ▤ ۱. سرزمین ۲. کشور ۳. دوروبر و درودیوار

**وڵاتپارێز** / w(i)łatparêz/: ئاوەڵناو. وەڵات پارێز؛ نیشتمان‌پەرست ▤ میهن‌پرست

**وڵاتپارێزی** / w(i)łatparêzî/: ناو. نیشتمان‌پەرستی ▤ میهن‌پرستی

**وڵاتپەرست** / w(i)łatperist/: ئاوەڵناو. نیشتمان‌پەرست؛ وڵاتپارێز؛ زێدپەرست ▤ وطن‌پرست

**وڵاتخۆشەویست** / w(i)łatxoşewîst/: ☜ **وەتەن‌پەروەر**

**وڵاتگری** / w(i)łatg(i)rî/: ناو. داگیرکاری ▤ اشغالگری

**وڵاخ**[۱] / w(i)łax/: ناو. ولاغ: ۱. کەر ۲. گا و گامێش ۳. یەکسم ▤ ۱. اُلاغ ۲. گاو و گاومیش ۳. ستور

**وڵاخ**[۲]: ئاوەڵناو. *[بەلار]* ولاغ؛ کەر؛ نەفام؛ بێ‌عەقل ▤ بی‌شعور

**وڵاخدار** / w(i)łaxdar/: ناو. ولاغدار؛ چاروێدار ▤ چاروادار

**وڵاخەبەرزە** / w(i)łaxeberze/: ناو. وڵاخی بەرزە؛ گا و یەکسم ≡ گاو و ستور

**وڵاخەڕێ** / w(i)łaxeřê/: ناو. وەڵاخەڕێ؛ وەلاخەڕێ؛ ڕێگەیێ کە ماڵاتی پێدا بڕوات ≡ راه مالرو

**وڵاش** / w(i)łaş/: ناو. ئامڕا؛ ڕەفێقی ڕێگە ≡ همسفر

**وڵاشم** / w(i)łaşim/: ئاوەڵناو. وەڵاشم: ١. شلی نەپێچراو ٢. بەرئاواڵە ≡ ١. شُل و ناپیچیده ٢. روباز

**وڵاغ** / w(i)łağ/: ☜ وڵاخ

**وڵاغار** / w(i)łağar/: ناو. داوەسێن؛ کەردار؛ چاروێدار؛ خەربەندە ≡ خربنده

**وڵاغدار** / w(i)łağdar/: ☜ وڵاخدار

**وڵاڵە** / w(i)łałe/: ناو. ئامرازێکە لە خەرەکدا ≡ ابزاری در چرخ دوکریسی

**وڵام** / w(i)łam/: ☜ وەرام

**وڵامبەر** / w(i)łamber/: ناو. خەبەربەر؛ پەیک ≡ پیک

**وڵامنێر** / w(i)łamnêr/: ناو. پەیامنێر؛ هەواڵنێر؛ هەواڵدەر ≡ خبرنگار

**وڵامە** / w(i)łame/: ناو. وەڵامە؛ شرۆڤە؛ ڕاڤە ≡ شرح؛ تفسیر

**وڵاو** / w(i)ław/: ☜ بڵاو

**وڵاونای** / w(i)ławnay/: چاوگ. ون کردن ≡ گم کردن

**وڵاوی** / w(i)ławî/: ☜ بڵاوی

**وڵاویای**[1] / w(i)ławyay/: چاوگ. ون بوون ≡ گم شدن

**وڵاویای**[2]: ☜ وڵیو

**وڵاوین** / w(i)ławîn/: چاوگ. ١. شێلان بە دەست ٢. بە دەست گووشین ≡ ١. مالش دادن ٢. چلاندن

**وڵاین** / w(i)łayin/: ناو. وەرژوو؛ وەرزوولا؛ لەپماڵ ≡ ماساژ

**وڵایەت** / w(i)łayet/: ناو. ١. وڵات؛ سەرزەمین ٢. شار؛ باژێر ≡ ١. منطقه ٢. شهر

**وڵتە** / wiłte/: ناو. گەراماسی ≡ تخم ماهی

**وڵچە** / wiłçe/: ناو. خونچەی تازە پشکووتوو ≡ غنچەی تازه دمیده

**وڵحێ** / wiłĥê/: ئاوەڵناو. *[جنێو]* ولحێ: ١. بلح؛ ناتێگەیشتوو ٢. سووک و چرووک ٣. گوێنەدەر؛ کەترەخەم ≡ ١. ابله ٢. هرزه ٣. لاقید

**وڵس** / wiłs/: ☜ **وڵسات**

**وڵسات** / wiłsat/: ناو. وڵس؛ ئاژەڵ؛ ماڵات؛ دەوڵەت ≡ دام؛ حیوان اهلی

**وڵف** / wiłf/: ناو. ولیفەت؛ جووت؛ نێر بۆ مێ و مێ بۆ نێر «... کاتێ هەموو گیانەکانیش ولفی یەک بوون ... «هەژار، *قورئان*»» ≡ جُفت؛ همسر

**وڵفرام** / wiłf(i)ram/: ☜ **تەنگستەن**

**وڵک** / wiłk/: ناو. ١. گورچیلە؛ گورچک؛ گورچەویلە ٢. جەرگ؛ کەزەب ≡ ١. کُلیه ٢. جگر

⊡ **وڵک برین**: *[مەجاز]* توند و بەزەبر لە ناوزگ دان ≡ محکم توی شکم زدن

**وڵک بە ساجەوە دان**: *[مەجاز]* جەرگ سووتاندن؛ تووشی دەرد و ئازار کردن ≡ جگر سوزاندن؛ بسیار آزار دادن

**وڵکبڕ** / wiłkbiř/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* گورچووبڕ؛ چێشتی سوێر ≡ شور (غذا)

**وڵکە** / wiłke/: ناو. مەڵبەند؛ ناوچە «ئەو وڵکە و مەیان دڵ مەدا وە هەم/ ئیسە مەدۆ ڕەنگ گوڵ باخچەی ئێرەم «مینەجاف»» ≡ منطقه؛ قلمرو

**وڵماو** / wiłmaw/: ناو. بەفری شلی نیوەئاو ≡ برفاب

**وڵمە** / wiłme/: ناو. ١. پارچە گۆشتی زلی بێئێسک ٢. زەقایی سەر ڕان ٣. ☜ **گوڵمە** ≡ ١. گوشت لُخم ٢. قسمت بالایی ران ٣. ☜ **گوڵمه**

**وڵنگە**[1] / wiłinge/: ناو. زایەڵـە؛ دەنـگ دانـەوە ☰ پژواک

**وڵنگە**[2]: ئاوەڵـناو. ١. دەسەپاچە؛ پەک‌کەوتە؛ داماو ٢. هاتەران‌پاتەران؛ بـێ‌مانـا و بـێ‌سـەروبەر ☰ ١. دستپاچە ٢. چرت‌وپرت

**وڵوڵە** / wiłw(i)łe/: ناو. وروره؛ گـەرای نـاو زگـی مریشـک کـە هێشـتا نەبۆتـە هێلکـە ☰ اشپیل تخم‌مرغ

**وڵـوڵین** / wiłw(i)łîn/: ئاوەڵـناو. کەفەڵـووک؛ کەفەڵۆک؛ کەفەڵووکە ☰ مُتخلخل

**وڵـۆ** / w(i)ło/: ناو. گولۆ؛ گولبێنە؛ گولوێنە؛ گولوە ☰ گلوە

**وڵۆش** / w(i)łoş/: ناو. برووش؛ بروێش ☰ بلغور ریز

**وڵـە** / w(i)łe/: ناو. ١. ☜ **گوڵمە** ٢. ملە؛ جۆبـرە؛ جۆبرکە ٣. کون؛ قول ‹ولە ملە› ☰ ١. ☜ **گوڵمە** ٢. آبدزدک ٣. سوراخ

**وڵهـ** / wiłh/: ناو. هەڵۆ؛ ئەیلۆ؛ ئەلوە ☰ عقاب

**وڵیفەت**[1] / w(i)łîfet/: نـاو. ١. ولف؛ هـاوجووت ٢. ☜ **وەڵیفەتانە** ☰ ١. همسر ٢. ☜ **وەڵیفەتانە**

**وڵیفەت**[2]: ئاوەڵناو. خۆڕایی؛ بەبێ نرخ ☰ رایگان

**وڵیفەتانە** / w(i)łîfetane/: ناو. ☜ **وەڵیفەتانە**

**وڵین** / w(i)łîn/: چاوگ. ١. گلۆفین؛ گوشـین لـە ناو دەست ٢. تێکوشـین ٣. شـێلان ☰ ١. مُچالـە کردن ٢. ترید کردن ٣. ماساژ دادن

**وڵیو** / w(i)łîw/: ↓

⊡ **وڵیو بوونەوە**: هێندێک کرژ بوونەوەی منداڵـی ساوا ‹منالەکەیان وڵیو بووەسەو بیگریتە باوشـەو› ☰ قدری بالیدن نوزاد

**وڵیەفەتی** / wiłyefetî/: نـاو. /کنایە/ وەڵـیەفەتی؛ مێرد ‹بە چ ڕوو دەچییەوە لای ولیەفەتی؟ «جـەنابی مەلا»› ☰ شوهر

**وڵێنی** / w(i)łênî/: ناو. قومری ☰ قمری

**وڵێـو** / w(i)łêw/: ئاوەڵـناو. ولاویـای؛ جوانچـاک؛ پێکەوتوو؛ شۆخ و شەنگ ☰ زیبای شوخ و شنگ

**وڵێوی** / w(i)łêwî/: نـاو. جوانچاکی؛ پێکـەوتوویی؛ شۆخ و شەنگی ☰ شوخ و شنگی

**ون**[1] / win/: ئاوەڵـناو. گوم؛ نادیار ‹ڕۆژی بەختیٚ هەر لە ژێر هەورێکی ڕەشدا لاوی کورد/ تاکوو ڕوخسـاری کچی شاری لە پێش چاوان ونە «هێمن»› ☰ گُم

⊡ **ون بون**: وندا بوون/ بین؛ گوم بوون ‹لە مەحوی دڵ ئەگەر ون بوو، وەکوو گەنج/ سۆراغی کـەن لـە کونجی کۆنەوێران «مەحوی»› ☰ گُم شدن

**ون کردن**: وندا کردن؛ گوم کردن ‹تۆزی بێ دینی عەجەب جادەی ویلایەت ون ئـەکا/ گێژەڵـووکەی مەعسیەت ڕێگەی هیدایەت ون ئەکا «بێخود»› ☰ گم کردن

**ون**[2]: جێناو. ئێوە؛ هۆن؛ ئەنگۆ؛ هنگ ☰ شما

**ونا**[1] / w(i)na/: ئاوەڵناو. ١. گوم؛ نادیار ٢. بـەلاش؛ خۆڕایی ☰ ١. گُم ٢. مُفت؛ مجانی

**ونا**[2]: ☜ **ونی**[2]

**ناخ** / w(i)nax/: ☜ **وەناق**

**ونار**[1] / w(i)nar/: ناو. ١. خێشـکێ کـە زەوی پـێ تەختە ـ تەختە دەکەن بۆ چاندن ٢. بنار؛ داوێـنی کێو ٣. شێوی سێ‌گاسنە ☰ ١. شخم صاف‌کنی کە کَردها را تقسیم می‌کند ٢. دامنەی کوە ٣. شخم سـە خیشە

**ونار**[2]: ئاوەڵناو. بەرهەڤ؛ تەیار؛ ئامادە ☰ آمادە

**ونـارای** / w(i)naray/: چـاوگ. ١. هەڵـوەژاردن؛ بەرهـەڤ کـرن ٢. تـەکووز کـردن؛ ڕێـک‌وپێـک کـردن ٣. ڕاگـرتن؛ وێسـاندن ‹تیـپ تیـپ بـەی دەستوور جە لا نسـاران/ چـوون تـەوافچیان دەسـتە وناران «ئەحمـەد بـەگی کۆماسـی»› ☰ ١. راسـت و ریست کردن ٢. مُرتب کـردن؛ جمع‌وجـور کـردن ٣. نگهداشتن؛ متوقف کردن

**ونـاردن** / w(i)nardin/: چـاوگ. ئامـادە کـردن ☰ آمادە کردن

**وناندن** / w(i)nandin/: چاوگ. هۆندنەوەی کەزی و... ☰ آراستن و بافتن مو

**وناو** / w(i)naw/: ☜ **بناو**[1]

**وناوچ** / w(i)nawiç/: ناو. بناو؛ بناڤ ☰ درخت زبان گنجشک

**ونبو** / winbû/: ئاوەڵناو. وندابوو؛ گومبوو ☰ گمشده

**ونتار** / wintar/: ناو. بنار؛ بنەتار؛ پاڵداوێن؛ پێدەشت؛ خواری یاڵ و چیا ☰ دامنەی کوه

**ونجڕ** / wincir̄/: ئاوەڵناو. ڕیزاڵ - ڕیزاڵ؛ شڕودڕ ☰ لت و پار

**ونجڕبەونجڕ** / wincir̄bewincir̄/: ☜ **ونجڕ- ونجڕ**

**ونجڕ ـ ونجڕ** / wincir̄ wincir̄/: ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. ونجڕبەونجڕ؛ شڕ و وڕ ☰ پارەپورە

**وندا** / winda/: ئاوەڵناو. وەندا؛ گوم؛ ون؛ نادیار ‹نالینەک تێ گوهێ من، لێ وندا و نهانە/ ئاگر بەر دا دلێ من، تەڤ بوو پێت و دخانە «جگەرخوێن»› ☰ گم

▣ **وندا بون**: ☜ **ون بون/ بین**

**وندا کرن**: ☜ **ون کردن**

**وندابو** / windabû/: ☜ **ونبو**

**وندابویی** / windabûyî/: ناو. گومی؛ ونی؛ نادیاری ☰ گمی؛ ناپیدایی

**وندایەنە** / windayene/: چاوگ. خوێندن ☰ خواندن

**وندایی** / windayî/: ناو. هێلاندش؛ ونی؛ گومی ☰ گُمی؛ ناپیدایی

**ونستن** / w(i)nistin/: چاوگ. گوتن؛ وتن ☰ گفتن

**ونگە** / winge/: ناو. بناوان؛ بەربەندی ئاو ☰ برغاب

**ونە** / w(i)ne/: جێناو. ئەو؛ ئەوە ☰ آن

**ونەوز** / w(i)newz/: ☜ **وەنەوز**

**ونەوشک** / w(i)newişk/: ناو. وەن؛ قەزوان ☰ پستە کوهی

**ونەون** / w(i)newin/: ☜ **وراوە**

**ونی**[1] / w(i)nî/: ناو. ووون؛ خوێن؛ خین ☰ خون

**ونی**[2]: ئاوەڵکار. ونا؛ ئاوها؛ بەمجۆرە ☰ این طور

**ـ ونی**[3]: پاشەوشە. ـ ونکە؛ کاری ون کردنی شتێ ‹شوێنەونی› ☰ عمل گم کردن

**ونیای** / winyay/: چاوگ. خوێنران ☰ خوانده شدن

**ونیایش** / w(i)nîyayîş/: چاوگ. ڕوانین؛ تواشاکردن؛ فت کردن؛ لێمەیزاندن ☰ نگاه کردن

**وونهوەی** / wunh(i)wey/: ئاوەڵناو. خوێنگر؛ خوێنئەستێن ☰ خونخواه

**ووياتەی** / wuyatey/: چاوگ. پێکەنین؛ خەنین؛ کەنین؛ خەنە کردن ☰ خندیدن

**وویاییش** / wuyayîş/: چاوگ. پێکەنین ☰ خندیدن

**وۆ** / wo/: دەنگ. ١. هۆی؛ ئاهای ٢. ئۆف داد لە دەس ☰ ١. ای؛ حرف ندا ٢. وای

**وۆجا** / woca/: ئاوەڵکار. وۆزا؛ وۆژا: ١. لەوێ؛ لەوێنە ٢. ئەوجار ☰ ١. آنجا ٢. آنگاه

**وۆحا** / woĥa/: دەنگ. وەحە؛ دەنگی بانگ کردنی گا و مانگا بۆ گەڕانەوە ☰ هَچ؛ صدای برگرداندن گاو

**وۆحە** / woĥe/: ☜ **وەحە**

**وۆزا** / woza/: ☜ **وۆجا**

**وۆژا** / woja/: ☜ **وۆجا**

**وۆش** / woş/: دەنگ. وەششە؛ دەنگی لا کردنەوە و ڕاگرتنی ولاخ ☰ هُش

**وۆشۆ** / woşo/: ☜ **وشۆ**

**وۆڵت** / woɫt/: ناو. ڤۆلت؛ یەکەی پێوانی وزەی ڕەوتی کارەبا ☰ ولت

**وۆڵتمیتر** / woɫtmîtr/: ناو. کەرەسەیەک بۆ پێوانی جیاوازی پوتانسیەل لە خاڵی جۆراوجۆری خولگەیەکدا بە گوێرەی وۆڵت ☰ ولتمتر

**وۆنی** / wonî/: ئاوەڵکار. ئاوەها؛ بەمجۆرە ☰ این طور

**وۆیە** / woye/: ناو. خوشک؛ خوەیشک؛ خوار ☰

خواهر

**ووو**[1] / wû/: جێناو. ئـەو؛ هـەو؛ جێنـاوی ئامـاژە بـۆ سێهەم کەسی تاک ‹ووو گۆت› ⇐ او؛ وی

**ووو**[2]: ئامراز. وە؛ پیتی با دانەوە ⇐ حرف عطف

**ووڕ** / wûř/: ناو. خارشت؛ خورووی لەش ⇐ خارش بدن

**ووشی** / wûşî/: ☜ **وشو**

**وون** / wûn/: ☜ **ونی**[1]

**وە**[1] / we/: ئاوەڵناو. وەها؛ وا؛ ئاوەها؛ ئـاوا ‹کـاری وە زۆر چاکە› ⇐ چنان

**وە**[2]: جێناو. ۱. ئەو؛ هـەو ۲. ئێـوە؛ ئـەنگۆ ‹لـە بـەر خاترێ وە دەچم› ۳. ئەوە ‹بواری وەم نادەن لە نێـو مێرگە چەکۆ هەڵتووتەکێم/ چونکـە پرسـەی دایکـی ملبـەکوێن و سەرشـینم دەوێ «هـێمن»› ⇐ ۱. او؛ وی ۲. شما ۳. آن

**وە ـ**[3]: پێشگر. ۱. بە؛ نیشـانەی ئاوەڵـکار بـە مانـای لەگەڵ؛ وێڕای ‹وەزوویی؛ وەخێر› ۲. بـە؛ خـاوەن ‹وەنـاموس؛ وەجـەرگ؛ وەبـا› ۳. ڤە ـەوە؛ نیشانەی دووبارە بوون یان دووپاتە کردنەوەی کار (لــە پــێش چاوگــەکان و نیزامــی فیعلــدا دێ) ‹وەخواردن؛ وەئەستاندن؛ وەخوێندن؛ وەدۆزیـن› ⇐ ۱. بـ ۲. با ۳. بازـ؛ واـ؛ پس ـ

**وە**[4]: ئامراز. ۱. بە؛ وتەی سوێند ‹وە خوا؛ وە هەرچی مەردە› ۲. بە؛ لەگەڵ ‹وە تۆ ئێژم› ۳. بـە؛ وێـڕای ‹وە ئێوەوە ئەوبنە چوار کـەس› ٤. بـەرەو؛ بـۆ لای ‹وە ژوور بڕوانە؛ وە بن کەوتم› ٥. بە؛ بـە بـان ‹دای وە سـەریا› ٦. بـەپێی ‹وە قسـەی تـۆ› ۷. بـە؛ لـە بەرانبەر ‹وە قرانێ نەمگـەرەک› ۸. بـە؛ نیشـانەی هەڵســەنگاندن ‹دوو وە دوو› ۹. بــە؛ نیشــانەی پەیوەندی ‹داد وە هەرکەس بـەم، حـەقم نیەسـینی «شامی»› ۱۰. بە؛ نیشانەی بـەرکاری ‹وە خێـزانم وت› ۱۱. بــە؛ نیشــانەی کــارێ، لــە ســەرەتای سازستە فیعلییەکاندا دێ ‹وە خـۆ نـازین؛ وە دەرد خواردن؛ وە کار هاتن› ۱۲. و؛ پـیتی پێوەنـدی لـە نێوان دوو وشە یـان دوو ڕسـتەدا ‹ژن وە پیـاو؛ وە ئەو کاتە زانیم چی ڕووی داوە!› ⇐ ۱. به ۲. به؛ بـا ۳. همراه؛ با ۴. به ۵. بر ۶. بر اساس ۷تا۱۱. به ۱۲. و

**وەئاخنین** / we'ax(i)nîn/: چـاوگ. ئاخنینــەوە ⇐ بازآکندن

**وەئەر** / we'er/: ☜ **وایر**[2]

**وەئەستاندن** / we'estandin/: چاوگ. ئەستاندنەوە؛ سانەوە ⇐ بازپس گرفتن

**وەئەی** / we'ey/: دەنگ. هۆی؛ وشەی بانگ کردن ⇐ ای؛ حرف ندا

**وەئیلا** / we'îlla/: ئامراز. ئەگین ⇐ وگرنه

**وەئێکتر** / we'êktir/: ☜ **وێك ـ۱**

**وەبا**[1] / weba/: نـاو. یەختەسـار؛ کـول؛ کولـک؛ درووشە؛ ئاهۆ؛ فەتا؛ چاوقوولکە؛ چاوقوولی؛ درمی ڕشانەوە؛ پەتایەکی تووشی ناوچەی گەرمێن کـە مرۆ تووشی زگەشۆرە، ڕشـانەوە، سـارد بوونـەوە، کەم بوونەوەی ئاوی لەش و لـە ئاکامـدا خەسـت بوونــەوەی خــوێن و شــین و ڕەش هەڵــگەڕانی پێست دەکا ⇐ وبا

**وەبا**[2]: ئاوەڵناو. بەبا؛ بەفاڵ؛ دێڵەبەبا ⇐ نرخواه (دله)

**وەباڵ** / webał/: ناو. ئۆباڵ؛ تاوان ‹وەباڵ بە ئەستۆم، قەت شتی وا نەبووە› ⇐ وبال

**وەبزا** / web(i)za/: ☜ **وەبزانە**

**وەبزانە** / web(i)zane/: ئامراز. وابزانە؛ وەبزا؛ وابـزا؛ وای حەسـاو کـە؛ وای دانـێ ‹وەبزانـە جیهـان بـە ئارەزووی تۆ دەگەڕێ/ ئەم چەرخ و خولەی هـەمووی بە فووی تۆ دەگەڕێ// وەبزانـە هـەزار سالـی ژیـای، پاشان چی؟/ مەرگێکە لـە سـەر ڕێگـە لـە دووی تـۆ دەگەڕێ «هەژار، *چوارینـەکانی خـەییام*»› ⇐ چنـین پندار؛ فرض کن

**وەبن** / webin/: ↓

▣ **وەبن دان**: ۱. خستنە ژێر ‹خراپ لێدەخورێ، تـا

ئێستا چەن کەسی وەبن داوە› ٢. تەشەنە کردنی برین ‹کوانەکەی وەبنی داوە› 🇮🇷 ١. زیر گرفتن ٢. سرایت کردن

**وەبن کەوتن** ١. بەرەو لای خواروو بوونەوە ‹مـن وەبن کەوتم› ٢. /کینایە/ زیان لـێ کـەوتن ‹لـەو سەدایەن وەبن کـەوت› 🇮🇷 ١. بـە زیـر افتـادن ٢. زیان دیدن

**وەبون** / webûn/: چاوگ. کرانەوە؛ کریانەوە 🇮🇷 باز شدن

**وەبەر** ↓

⊡ **وەبـەر دان** خستنە ژێر ‹سوارێ پیاوێکی وەبـەر دا› 🇮🇷 زیر گرفتن

**وەبـەر کەوتن** ١. ژێـر کـەوتن ‹وەبـەر ماشـین کەوتم› ٢. بەر کەوتن؛ بەش پێ گەیشتن ‹لەو بەش کردنەوە، ئەمنیش بزنێکم وەبـەر کـەوت› 🇮🇷 ١. زیر شدن ٢. نصیب شدن

**وەبەر گرتن** لە ژێـر (شـتێ) ڕاگـرتن ‹دەسـتی وەبەر گرە نەڕژێ› 🇮🇷 در زیر (چیزی) قرار دادن

**وەبـەر هـاتن** ١. میـوە دان بـۆ یەکـەم جـار ‹مێوەکـەمان ئەسـاڵ وەبـەر هـاتووە› ٢. /کینایە/ تـووش بـوون پێـڕای کۆمـەڵ ‹ڕەشـبگیر بـوو، منـیش وەبـەر هـاتم› ٣. پێکـران؛ وێکـەوتن ‹دەسرێژێکیان لێ کرد، باش بوو وەبەر نەهات› 🇮🇷 ١. بە ثمر نشسـتن ٢. گیـر افتـادن ٣. هـدف قـرار گرفتن

**وەبـەر هێشتن** بۆ هێشـتنەوە؛ پـێ ڕەوا دیـتن ‹وەبەر من نایەڵێ لێرەش مەی و سـاقی، جـەنابی شێخ/ دەنا لەو لا شەراب و حۆری با هەر بۆ جەنابی با «هێمن»› 🇮🇷 روا دیدن

**وەبەر هێنان** بەرهەم هێنان؛ چێکردن ‹ئەوسـاڵ چەوەندەری باشمان وەبەر هێنا› 🇮🇷 تولید کردن

**وەبەردڵان** / weberd(i)łan/: ئاوەڵناو. خۆش؛ دڵـگر 🇮🇷 دلپذیر

**وەبەرهاتـو** / weberhatû/: ئاوەڵـناو. دابـین؛ سـاز؛ مسۆگەر 🇮🇷 فراهم

**وەبەرهێن** / weberhên/: ناو. بەرهەمهێنەر؛ کەسێ کە بەرهەمی دێنێتە حاسڵ 🇮🇷 تولید کننده

**وەبەرهێنـەر** / weberhêner/: نـاو. بەرهەمهێنـەر؛ چێکـەر؛ ئـەو کەسـەی بەرهـەم دەهێنـێ 🇮🇷 تولیدکننده

**وەبـەسـتن** / webestin/: چـاوگ. بەسـتنەوە؛ ڤەبەستن 🇮🇷 چیزی را به چیز دیگر بستن

**وەبیـایش** / web(i)yayîş/: چـاوگ. ١. قەڵشـان؛ تلیشیان؛ قەڵش بردن ٢. تێکـوڵ کـردن؛ تـۆکڵ گردنەوە 🇮🇷 ١. شکاف برداشتن ٢. پوست کندن

**وەبیـرهێن** / webîrhên/: ئاوەڵـناو. وەبیرهێنـەر؛ بیرهێنەرەوە 🇮🇷 یادآور

**وەبیرهێنەر** / webîrhêner/: ☜ وەبیرهێن

**وەپـا** / wepa/: ئاوەڵـکار. ١. لـە سـەر پـێ ٢. بـە پیادەیی ‹ماشین نەو، وەپا هاتم› ٣. بـە لاق ‹وەپا لێم دا› 🇮🇷 ١. ایستاده ٢. پیاده ٣. با پا

**وەپـاڕ** / wepař/: نـاو. کـاری پاڕانـەوە؛ داوای بـە زەلیلی 🇮🇷 لابه

**وەپـاڕان** / wepařan/: چاوگ. پاڕانەوە؛ وەپاڕانـەوە؛ لالانەوە 🇮🇷 لابه کردن

**وەپاڕانـەوە** / wepařanewe/: چـاوگ. وەپـاڕان 🇮🇷 لابه کردن

**وەپاڵ** / wepał/: ↓

⊡ **وەپاڵ خستن** پاڵخستن؛ بە سەر زەویـدا درێـژ کردن ‹وەپاڵیخەن نەدارێتەوە› 🇮🇷 خوابانیدن

**وەپـاڵ دان** کارێ، شتێک بە کەسێکەوە لکاندن ‹ئەو تۆمەتەیان وەپاڵ داوە› 🇮🇷 نسبت دادن

**وەت** / wet/: ئاوەڵکار. ئەوێ؛ هۆوێ 🇮🇷 آنجا

**وەتا** / weta/: ئاوەڵکار. وەتێ؛ لەو ساوە؛ لەو کاتەوە 🇮🇷 از آن هنگام

**وەتـاخ** / wetax/: ☜ وەتاغ

**وەتاغ** / wetağ/: ناو. وتاخ؛ وەتاخ؛ ژوور؛ دیـو؛ دیم؛ ئۆدە؛ هۆدە؛ ئوتاق؛ وتـاق؛ چاوەخـانوو؛ چاوەمبـاڵ؛ دیوەخـان؛ دویـز؛ ژووری دانیشـتن؛ ژووریکـی سەرگیراوی ماڵ کە بـە دیـوار لـە بەشـەکانی تـر جویَ بۆتەوە ‹... دەژنەوی؟ هیچ. دەبینی؟ هیچ. چ دەبینی؟ بـەژن و بـاڵای بـەرزی ئاغـا لـە وەتاغـا ... «هەژار، *چوار ئاملیکه*»› ☰ اتاق

**وەتـانـاییش** / wetanayîş/: چـاوگ. یـاخی بـوون؛ سەرپیَچی کردن لە فەرمان ☰ یاغی شدن

**وەتر** / wetir/: ئاوەڵکار. ١. واتر؛ لەوە پتر ‹ئـەوەی گوت و وەتر!› ٢. وا؛ وەها ‹ئەویش هـەر وەتـر!› ☰ ١. بیش از این ٢. همین طور

**وەتراخ** / wetrax/: ناو. ١. لیسی بـاز بـە سـەرەوە نیشتن ‹لە سەر وەتراخی دەشتی ڕۆح و شاخوداخی بەرزی دڵ/ هومای ئەوجی سەعادەت، بـازی عیرفـان ئاشیان ڕۆیی «بیَخود»› ٢. جلکە کۆن ☰ ١. چـوب بر نشستن باز ٢. لباس کُهنه

**وەتراخچـی** / wetraxçî/: نـاو. کۆنــەفرۆش ☰ کهنه‌فروش

**وەتگە** / wet(i)ge/: ئاوەڵناو. ئامادەی جووت گرتن (بۆ بزن) ☰ آماده‌ی جفتگیری (بُز)

**وەتن** / wetin/: چاوگ. وتن؛ گوتن ☰ گفتن

**وەتە** / wete/: ناو. باتوو؛ گون؛ خا ☰ خایه؛ بیضه

**وەتەبا** / weteba/: نـاو. قۆڕی؛ دۆخی گون ئاوسان ☰ فتق خایه

**وەتـەر** / weter/: نـاو. *[هندسـه]* ١. لاسـکی ڕووبەڕووی گۆشـەی °٩٠ لە سیَ گۆشـدا ٢. لەتـە خەتیَکی ڕاسـت کـە جـەغز دەکاتـە دوو بەشـی نابەرامبەرەوە ☰ ١و٢. وتر

**وەتـەرنـاییش** / weternayîş/: چـاوگ. مەشـق کردنی سەربازان ☰ مشق کردن سربازان

**وەتـەک** / wetek/: نـاو. هـەویَردە؛ کەڕەواڵـە ☰ بلدرچین

**وەتەن** / weten/: نـاو. ژیگـە؛ زیَـد ‹پیَـی نـاویَ بـۆ شەهیدی وەتەن شیوەن و گرین/ نامرن ئەوانـە وا لـە دڵی میللەتا ئەژین «پیرەمیَرد»› ☰ وطن

**وەتەنپەرست** / wetenperist/: ☜ **وەتەنپەروەر**

**وەتەنپـــەروەر** / wetenperwer/: ئاوەڵــــناو. وەتەنپەرست؛ وەتەنحەز؛ وەتـەنخۆشەویسـت؛ وەتـــەندۆســـت؛ وڵاتخۆشەویســـت ‹هـــەر وەتەنپەروەر غەرقی زیللەتە/ خۆراک و خـەوی دەرد و میحنەتە «بیَکەس»› ☰ میهن‌پرست

**وەتەنحەز** / wetenĥez/: ☜ **وەتەنپەروەر**

**وەتەنخۆشەویســـت** / wetenxoşewîst/: ☜ **وەتەنپەروەر**

**وەتەندۆست** / wetendost/: ☜ **وەتەنپەروەر**

**وەتەنی** / wetenî/: ئاوەڵناو. ١. وەتـەنپەرسـت ٢. هی ناو خۆ ☰ ١. میهن‌پرست ٢. وطنی

**وەتەی** / wetey/: چاوگ. داکەندن ☰ کندن

**وەتی** / wetî/: ☜ **وەتا**

**وەج**[1] / wec/: نـاو. وەرج: ١. حورمـەت؛ ڕیَـز ‹وەج نـەمان› ٢. قیمـەت و نـرخ ‹وەجـی شـکاوە› ٣. کەڵک؛ فایدە ‹کـاریَکی بیَ وەجـە، نایکـەم› ☰ ١. شأن؛ احترام ٢. بها؛ قیمت ٣. بهره

**وەج**[2]: ئاوەڵناو. ئاتـاج؛ دەسـکورت ‹ئـەز وەجـم› ☰ نیازمند

**وەجاخ** / wecax/: ☜ **وجاخ**

**وەجاخزادە** / wecaxzade/: ☜ **وجاخزادە**

**وەجاخکویَر** / wecaxk(i)wêr/: ☜ **وجاخکویَر**

**وەجاخکۆر** / wecaxkor/: ☜ **وجاخکویَر**

**وەجاغ** / wecağ/: ☜ **وجاخ**

**وەجاغزادە** / wecağzade/: ☜ **وجاخزادە**

**وەجاغکویَر** / wecağk(i)wêr/: ☜ **وجاخکویَر**

**وەجە** / wece/: نـاو. چـەپک؛ دەسـتە ☰ گیـاه بـە اندازەی یک دست

**وەجەر** / wecer/: نـاو. دەستوور؛ فـەرمان؛ فتـوا ☰

اجازه؛ فتوا

**وەجەیی** / weceyî/: ناو. پێویستی؛ پێداویستی؛ ئەوەجەیی ⚑ ضرورت؛ احتیاج

**وەچ** / weç/: ناو. وەچە: ١. بەچ؛ بێچوو ٢. لکی لە لق دەرچوو ٣. نەوە و نەتیژە ٤. بەهرە و قازانج ‹ئەم کارانە وەچ نادا› ⚑ ١. بچە ٢. جوانە از نشا و شاخە ٣. نبیرگان ۴. سود؛ بهرە

⊡ **وەچ دان**: ١. بێچوو هێنان ٢. ☜ **وەچ کردن** ⚑ ١. زاد و ولد کردن ٢. ☜ **وەچ کردن**

**وەچ کردن**: وەچ دان؛ وەچ دەرکردن؛ لقی تازە دەرکردن ⚑ جوانە زدن

**وەچکە** / weçke/: ☜ **بەچکە**

**وەچناندن** / weç(i)nandin/: چاوگ. ڤەچنین؛ چنینەوە ⚑ رفو کردن

**وەچوبەرە** / weç û bere/: ناو. نەوە و نەتیجە ⚑ نوە و نتیجە

**وەچە** / weçe/: ☜ **وەچ**

**وەح** / weĥ/: دەنگ. ١. پەک؛ وتەی سەیرمان ٢. ☜ **وەحە** ⚑ ١. حرف تعجب ٢. ☜ **وەحە**

**وەحا** / weĥa/: ☜ **وەحە**

**وەحش** / weĥş/: ناو. حێوانەکێوی ‹وەخت شادی و عەیش ئەیامێ سەیرەن/ پەنەش دلشادەن، ئەر وەحش ئەر تەیرەن «سەیدی»› ⚑ جانور کوهی

**وەحشی**[1] / weĥşî/: ناو. واهش؛ واهشی؛ حێوانەکێوی ‹شکاری وەحشیان بەس دەستەمۆ کەن/ نە وەک بەر بێ شکاری خانەزاتان! «نالی»› ⚑ جانور کوهی

**وەحشی**[2]: ئاوەڵناو. واهش؛ واهشی: ١. دڕندە ‹یا شێتی عەشقی دلبەرە، ئاگای لە خۆی نییە/ یا وەحشییە کە هەمدەمی دەعبا و دڕندەیە «بێخود»› ٢. سڵ و قوشقی و نارام ٣. */پلار/* نەفام؛ بێئاوەز ٤. */پلار/* بێوەری لە شارستانیەت ٥. */مەجاز/* زاڵم؛ ملهوڕ ⚑ ١. درّندە ٢. رموک و رام نشدە ٣. بی‌شعور ۴. بی‌تمدن ۵. ستمکار

**وەحشییانە**[1] / weĥşîyane/: ئاوەڵناو. دڕندانە؛ دژە مرۆیانە ‹ڕۆژاوای کوردستان کەوتۆتە بەر هێرشێکی وەحشییانەوە› ⚑ وحشیانە

**وەحشییانە**[2]: ئاوەڵکار. ١. بە پەتبڕاوی؛ بە پەتپساوی؛ بەبێ تێڕامان و کۆکردنەوە ‹وەحشییانە نان دەخوا› ٢. بە بەرەڵایی؛ بە شێوەی دوور لە بنەمای کۆمەڵایەتی ‹ڕۆژاوای کوردستانیان وەحشییانە بومباران کرد› ٣. بە دڕندەیی؛ دڕندانە ‹وەحشیانە بەر بوونە سەر ماڵ خێزانی شارەکە!› ⚑ ١تا٣. وحشیانە

**وەحوەح** / weĥweĥ/: دەنگ. وەحە؛ وۆحە؛ وتەی لێخوڕینی گا و مانگا ‹ڕەقیب ئەو دامەنەی دی سەوزە، وەک گا لرفی بۆ هێنا/ نەبوو حالی لە لەفزی عەیبە! عەیبە! تا وتم: وەحوەح! «مەحوی»› ⚑ هُچە؛ کلمەی راندن گاو

**وەحە** / weĥe/: دەنگ. وەح؛ وەحا؛ وەحوەح؛ وەحەو؛ وۆحە؛ وتەی لێخوڕینی گا و مانگا ⚑ هُچە؛ کلمەی راندن گاو

**وەحەو** / weĥew/: ☜ **وەحە**

**وەحی** / weĥy/: ناو. پێخەم؛ پەیامی خودایی؛ پەیام یان وریا کردنەوەیەک لە لایەن خوداوە بۆ کەسێ (بەتایبەت پێغەمبەران) ⚑ وحی

**وەخ** / wex/: دەنگ. ئاخ؛ هاوار لە بەر ژان و دەرد ⚑ آخ

**وەخت** / wext/: ناو. ١. وەخەت؛ واخت؛ وەقت؛ کات؛ سات؛ دەم؛ گاڤ ‹وەختی کولێرە، عەشرەت گلێرە «مەسەل»› ٢. ☜ **بەخت**[1] ⚑ ١. وقت ٢. ☜ **بەخت**[1]

⊡ **وەخت بوون**: ١. نزیک بوون؛ خەریک بوون ‹سلاوت لێدەکەم جوابم دەوە، هەر وەختە پەڕ دەرکەم/ تکاشت لێدەکەم: تۆزێ نەوازش، دل هەراسانە «ئاوات»› ٢. وەخت کردن؛ سەر

پــەرژان؛ وەخــت هــەبوون ‹وەختــت هەیــە بیخوێنییەوە؟› ≡ ١. نزدیک بودن ٢. وقت داشتن

**وەخت کردن**: ☜ **وەخت بون ـ٢**

**وەختارێ / wextarê**/: ئاوەڵکار. وەختــێ؛ کاتــێ ≡ آنگاه

**وەختان / wextan**/: ناو. دەمان؛ زەمان ≡ زمان

**وەختانوەخت / wextanwext**/: ☜ **وەختاوەخت**

**وەختاووەخت / wexta w wext**/: ☜ **وەختاوەخت**

**وەختاوەخـــــت / wextawext**/: ئاوەڵـــــــکار. وەختانوەخت؛ وەختاووەخت؛ وەختراوەخت: ١. لە شەو و ڕۆژدا جارێ ‹ئـەم دەرمانـە وەختاوەخـت دەخـۆی تـا حــەوت ڕۆژ› ٢. وەخـــتبـــەوەخت؛ جاربـــەجار ‹وەختاوەخـــت لێمـــان بپرســـە!› ≡ ١. شبانەروز یک بار ٢. گاهگاهی

**وەختبەوەخت / wextbewext**/: ☜ **وەختاوەخـت ـ٢**

**وەختراوەخت / wext(i)rawext**/: ☜ **وەختاوەخت**

**وەختگیر / wextgîr**/: ئاوەڵناو. کاتبەر؛ درێژخایـەن ≡ وقتگیر

**وەختوناوەخت / wext û nawext**/: ئاوەڵـکار. گـا و بێگا؛ گوڕایگوڕ؛ لەسەر یەک و لە کاتی نالـەباردا ‹تۆ لەوێ خەمەدراوسێت هێندە هەبوون/ بە پـەیژیی وەختوناوەختا/ دڵسـۆزیتان سمـۆرە بـوون/ بـۆ لای یــەکتر دائەبــەزین، ســەرئەکەوتن «شــێرکۆ»› ≡ وقتوبیوقت

**وەختۆ / wexto**/: ئاوەڵکار. ئەوساکە؛ ئەو وەختە ≡ آن زمان

**وەختە / wexte**/: ناو. نێری و بـەرانی دابەسـتە ≡ تکه و قوچ پروار

**وەختەکە / wexteke**/: ئاوەڵکار. دەمـا؛ کـاتێکی ≡ وقتی

**وەختی / wextî**/: ئاوەڵـناو. سـەردەمی؛ کـاتی؛ نـە هەمیشەیی ≡ موقتی

**وەختێ / wextê**/: ئاوەڵـکار. وەختـارێ؛ کاتــێ ≡ آنگاه

**وەختێکی / wextêkî**/: ئاوەڵکار. وەقتا؛ وەقتـوو؛ لـە کاتێکدا ≡ زمانی

**وەخژن / wexjin**/: ناو. ئۆقرە؛ ئۆخژن ≡ آرامش

**وەخستن / wexistin**/: چاوگ. دالەقانـدن؛ ئـاوێزان کردن ‹زریزەی بـە کـەوادا وەخسـتووە› ≡ آویـزان کردن

**وەخشە / wexşe**/: ناو. بەخشش ≡ بخشش

**وەخم / wexm**/: ناو. ١. بۆنی گـرانی زۆر نـاخۆش ٢. هەوای زۆر گران و ناخۆش ٣. تاوت؛ داربەست ≡ ١. بوی تُند و مُتعفن ٢. هوای بسیار بد ٣. تابوت

**وەخـواردن / wex(i)wardin**/: چـاوگ. وەخـــوارن؛ ڤەخارن ≡ نوشیدن

**وەخوارن / wex(i)warin**/: ☜ **وەخواردن**

**وەخوێندن / wex(i)wêndin**/: چـاوگ. خوێندنـەوە ≡ مطالعه کردن

**وەخەت / wexet**/: ☜ **وەخت ـ١**

**وەخەیر / wexeyr**/: ☜ **وەخێر**

**وەخێر / wexêr**/: نزا. وەخەیر؛ ئۆغر بە خێـر ≡ بـە سلامت

**وەدا / weda**/: نـاو. ١. مــالاوایی؛ خواحــافیزی ٢. ئۆدا؛ دایک ≡ ١. خداحافظی ٢. مادر

**وەدارتــش / wedartiş**/: چـاوگ. وەداروتـــش: ١. وەداردایـیش؛ وەداردش؛ وەدەتـش؛ وەدەرتـش؛ شاردنەوە ٢. ناژتن؛ بن عەرد خستن ٣. تـەقینی تەقەمەنی ≡ ١. قایم کردن ٢. دفن کردن ٣. مُنفجر شدن مادەی مُنفجره

**وەداردایش / wedardayîş**/: ☜ **وەدارتش ـ١**

**وەداردش / wedardiş**/: ☜ **وەدارتش ـ١**

**وەداروتش / wedarutiş**/: ☜ **وەدارتش**

**وەدان / wedan**/: چاوگ. ١. دان؛ داین ٢. دانـەوە؛ گەڕاننەوە (قـەرز، ئامانـەتی و ...) ٣. هەڵـکەندن؛

دانەوە (زەمین و ...) ٤. کەوانــە کردنــەوە ‹خــۆر تیشکی وەدا لـە ئاوێنــەوە› ☰ ١. دادن ٢. پـس دادن (وام، امانت و ...) ٣. کندن ۴. مُنعکس شدن

**وەدایەنــە** / wedayene/: چـاوگ. وەشـــارتن؛ شاردنەوە ☰ پنهان کردن

**وەدایش** / wedayîş/: ناو. ئیمسک؛ زیپکەی لێوی تادار ☰ تبخال

**وەدڵ** / wediɫ/: ئاوەڵکار. بەدڵ ☰ از ته دل

**وەدۆزین** / wedozîn/: چاوگ. وەدیـن؛ دۆزینـەوە؛ دیتنەوە ‹کتێبەکەم بۆ وەدۆزە› ☰ بازیافتن

**وەدەتش** / wedetiş/: ☚ **وەدارتش ـ١**

**وەدەرتش** / wedertiş/: ☚ **وەدارتش ـ١**

**وەدەرنــراو** / wedern(i)raw/: ئاوەڵناو. هلقــەتایی؛ دەرکریاگ ☰ بیرون رانده شده

**وەدەم** / wedem/: ئامراز. پێـرای؛ ویـرای؛ لەگـەڵ؛ لەتەک ☰ همراهِ

**وەدی** / wedî/: ئاوەڵناو. بەدی؛ پەیـدا؛ خویـا؛ دیـار ‹سەرەتاتکێ، گا وەدی، گا نەوەدی› ☰ پیدا

⊡ **وەدی بـون**: دەرکەوتن؛ بەرچاو کـەوتن ☰ پیـدا شدن؛ ظاهر شدن

**وەدی کردن**: بە چاو دیتن؛ بیـنین ‹هـیچم وەدی نەکرد› ☰ مشاهده کردن

**وەدی هـاتن**: ڕوو دان ‹نـەمگوت وەدی دێ؟ ئـەوا وەدی هات!› ☰ واقع شدن

**وەدی هێنان**: خولقاندن؛ دروست کردن ‹تا مـافی ڕەوای دەستێنێ/ ئاواتی تۆ وەدی دێنێ «هێمن»› ☰ آفریدن

**وەدیـتن** / wedîtin/: چـاوگ. بینینـــەوە؛ دینـــەوە؛ دیسان بینین ☰ بازدیدن

**وەدین** / wedîn/: چاوگ. دۆزینەوە ☰ بازیافتن

**وەدیهاتـو** / wedîhatû/: نـاو. ئافەریـدە؛ ئـافراو ☰ آفریده

**وەدیهێنـەر** / wedîhêner/: ناو. چێکەر؛ بەرهەمهێن ☰ سازنده

**وەر**[1] / wer/: نـاو. ١. خوەر؛ خۆر؛ تاو ٢. بەر؛ سنگ ٣. بــەر؛ ئـالی ٤. ☚ بــەرخ ـ١ ٥. تەتەڵـە؛ تەختەی لە سەر نووسین ٦. بەرگـەدە؛ خەمشـە؛ بانـەگا ٧. بـەفر؛ وەفـر؛ بـەور ٨. خواردەمـەنی؛ خۆراک ٩. بەرتیل؛ ڕشفەت ☰ ١. خورشـید ٢. بـر؛ سینه ٣. طرف؛ سو ۴. ☚ بەرخ ـ١ ۵. لوح ۶. زهـار ٧. برف ٨. خوردنی ٩. رشوه

⊡ **وەر بـادان**: ١. پێچـان ٢. پێچانـەوە ☰ ١. پـیچ دادن ٢. پیچیدن

**وەر کەفتەی**: تـاو هـەلاتن؛ خۆرەتـاو کـەوتن ☰ طلوع کردن آفتاب

**وەر نیشتەی**: خۆراوا بوون ☰ غروب کردن آفتاب

**وەر واردش**: ١. خــۆراک خــواردن ٢. بــەرتیل خواردن ☰ ١. غذا خوردن ٢. رشوه گرفتن

**وەر**[2]: ئاوەڵناو. ١. بەر؛ پێش ٢. ویـڵ؛ بـەرەڵا ☰ ١. جلو؛ پیش ٢. رها

⊡ **وەر بـون**: وەر بین: ١. بەر بـوون؛ مەرەخـەس بوون ٢. بە کۆمەڵ خەریکی کارێ بوون ‹مناڵ وەربوونە باغ هیچیان نەهێشت!› ☰ ١. رها شـدن ٢. دستەجمعی به کاری مشغول شدن

**وەر بین**: ☚ **وەر بون**

**وەر دان**: ١. بەردان؛ بەرەڵا کـردن ٢. لـێ زیـاد کردن؛ خســتنە سـەر ☰ ١. رهـا/ ول کـردن ٢. اضافه کردن

**وەر دان (لـە شتێ)**: تلاندن؛ تێـوەدان ‹هـەورێک شـۆڕابەی بـەر داوە/ دەڵـێی لـە قیریـان وەرداوە «هێمن»› ☰ آغشتن

**وەر دای**: بەردان ☰ رها کردن

**وەر کرن**: تووڕ هەڵدان؛ فـڕێ دان بـە نهـێم ☰ پرتاب کردن

**وەر کەوتن/ کەفتن/ کەتن**: ١. ڕاکشـان؛ ڕازان ٢. ئارام بوون؛ داکـەوتن ☰ ١. دراز کشـیدن ٢. آرام

شدن

**وەر**[٣]: ئاوەڵکار. بەر ‹مـن وەر جـە ئامـای نامـەی زگاریـت/ زووتـەر جـە خەبـەر کـۆس دیاریـت «مەولەوی»› 🇮🇷 پیش

**وەر**[٤]: ئامراز. ١. بەر؛ بەر لە؛ پـێش لـە ‹وەر لـە مـن هـات› ٢. وەگـەر ‹وەر عـەزمت کوشـتەی دڵـەی مەجنوون خۆن/ ڕەزای دڵی من چـەنی ڕەزای تـۆن «سەیدی»› 🇮🇷 ١. قبل از ٢. وگَر

**وەر ـ**[٥]: پێشوشە. بـەر ‹وەرزیـن؛ وەرکۆرپـە؛ وەرپـاڵ؛ وەرکۆ؛ وەراو› 🇮🇷 پیش

**ـ وەر**[٦]: پاشەوشە. ـ خۆر ‹فرەوەر؛ سووتوەر› 🇮🇷 ـ خور

**وەر ـ**[٧]: پێشگر. ١. هـەڵـ؛ بـۆ سـەر ‹وەرگـرتن› ٢. ژێروڕوو؛ پێچ ‹وەرگێرانەوە؛ وەرگەڕان› ٣. بە دەور؛ دە یەک ‹وەرچـەرخان؛ وەرانـین؛ وەردان› ٤. داـ؛ تێداـ ‹وەرمان› 🇮🇷 ١تا٣. بر ۴. وا ـ؛ فروـ

**ـ وەر**[٨]: پاشـگر. خـاوەن ‹جانـەوەر؛ بەختـەوەر؛ هونەروەر؛ پەلەوەر؛ سەروەر› 🇮🇷 ـ ور

**وەرار** /werar/: ☜ **وەرە**[١]**ـ١**

**وەراز**[١] /weraz/: نـاو. ١. وراز؛ بـەراز؛ خـووگ ٢. میراو؛ ئاریختێ؛ کەسێ کە بەسەر دابەش کردنی ئاودا ڕادەگا 🇮🇷 ١. گُراز ٢. میراب

**ـ وەراز**[٢]: پاشەوشە. پـەرت؛ پەڕتـەواز ‹لانـەوەراز› 🇮🇷 آواره

**وەرازیز** /werazîz/: ناو. بانەگا؛ بەرگەدە؛ زارگـا 🇮🇷 شرمگاه؛ زهار

**وەرافتن** /weraftin/: چـاوگ. پشاوتن؛ هەڵپشاوتن 🇮🇷 مُچاله کردن

**وەرام** /weram/: نـــــــاو. ولام؛ وەلام؛ ولام: ١. پەرسڤ؛ بەرسڤ؛ پاگۆ؛ باگۆ؛ واوێژ؛ جواو؛ جـواب؛ جاب ٢. ڕاسپێری بـە قسـە 🇮🇷 ١. پاسُخ ٢. پیغـام شفاهی

⊡ **وەرام دانـەوە:** وەلام دانـەوە؛ جـواب دانـەوە 🇮🇷 پاسُخ دادن

**وەرام نـاردن:** وەلام نـاردن؛ قسـە ڕاسـپاردن 🇮🇷 پیغام فرستادن

**وەرامدەر** /weramder/: ☜ **وەڵامدەر**

**وەرامین** /weramîn/: ناو. نانی لـە گـەنم و جـۆی تێکەڵاو 🇮🇷 نان گندم و جو با هم

**وەران**[١] /weran/: چاوگ. تێنەپەر. //وەرای؛ دەوەرێی؛ بوەرێ// ١. بارینی شتی وشـک و ورد ٢. ئامـای؛ هاتن ٣. پێچان؛ لێهـالان 🇮🇷 ١. ریـزش کـردن ٢. آمدن ٣. پیچ خوردن؛ پیچیدن دور چیزی

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەوەران

**وەران**[٢]: ☜ **بەران ـ١**

**وەرانتا** /weranta/: ئاوەڵناو. ١. درێژبووی؛ هەلاژیاگ ٢. دەرکێشـراو؛ دەرهێنـراو 🇮🇷 ١. درازکشـیده ٢. بیرون کشیده شده

**وەرانـتش** /werantiş/: چـاوگ. ١. دەرکێشـان؛ دەرهاویشـتن ٢. بنکـەن کـردن؛ بـە ڕیشـەوە دەرکێشان 🇮🇷 ١. بیرون کشیدن ٢. از ریشه کندن

**وەرانـدن** /werandin/: چـاوگ. تێـپەڕ. //وەرانـدت؛ دەوەرێـنی؛ بوەرێنـە// وەرانـن: ١. داوەرانـدن؛ باراندنی شـتی وشـک و ورد ٢. ئـانین؛ هێنـان؛ هاوردن ٣. لێهاڵاندن؛ لە شتێکدا پێچاندنەوە 🇮🇷 ١. فروریزاندن ٢. آوردن ٣. در چیزی پیچیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەوەراندن

**وەرانن** /weranin/: ☜ **وراندن**

**وەرانـین** /weranîn/: چـاوگ. پێچـان بـە دەورەدا ‹لحێف د وەرانی› 🇮🇷 به دور چیزی پیچیدن

**وەراو** /weraw/: ئاوەڵـناو. ١. بـەرئاو (پێچەوانـەی دێم) ٢. هێنراو؛ هاورياگ ٣. تێهاڵاو؛ لێهاڵاو؛ لە شتێکدا پێچراوەوە 🇮🇷 ١. آبی (مقابـل دیـم) ٢. آورده شده ٣. در چیزی پیچیده شده

**وەرای** /weray/: ئاوەڵـناو. شـیاو؛ هێـژا؛ لایـق 🇮🇷 شایسته؛ سزاوار

⊡ **وەرای ئامەیش:** پێکهاتن؛ ئاشتەوە بـوون 🇮🇷 بـه

توافق رسیدن

**وەرب** / werb/: ☜ **بەفر**

**وەربانە** / werbane/: نـاو. بەروانکـــە؛ بـــەروان؛ بەروانک ▬ پیشبند کار

**وەربوق** / werbuq/: ناو. قرپ؛ قرقێنە؛ قورقێنـە ▬ آروغ

**وەربە** / werbe/: ناو. وەرو؛ بەفر ‹نە واران مابـێ نـە وەربەی وەشتە/ سەرچەمێ وشکێ سـووچیا دەشـتە «مەلا عەلیئەکبەری ئەحمەدی»› ▬ برف

**وەربەردە** / werberde/: ناوەڵناو. خۆربردوو؛ تاوەنگاز ▬ آفتابزده

**وەربەن** / werben/: نـاو. بەرلـبێنە؛ بەرەلـبێنە ▬ پیشبند

**وەرپاڵ** / werpał/: ناو. بەرپاڵ؛ بنـار؛ پاڵـداوێن ▬ دامنەی کوە

**وەرپرس** / werpirs/: نـاو. بـەرپرس؛ لـێپرسـراو؛ بەرپرسیار ▬ مسئول

**وەرپۆش** / werpoş/: نـاو. چارەکـە؛ کۆڵـوانە ▬ رودوشی زنانە

**وەرپێچان** / werpêçan/: چـاوگ. وەر بـــادان ▬ برپیچیدن

**وەرپێچانەوە** / werpêçanewe/: چاوگ. وەرپێچان ▬ بر هم پیچیدن

**وەرپێچە** / werpêçe/: ناو. برین‌پێچی؛ زەخم‌پێچی ▬ پانسمان

**وەرت** / wert/: ناو. ١. بریکار؛ نایـب ٢. ناوەڕاسـت ▬ ١. نایب؛ وکیل ٢. وسط

**وەرتاخ** / wertax/: ناوەڵـناو. وەرتــاق؛ نیوەکــار؛ نیمەکارە و ناتەواو ▬ نیمەکارە

**وەرتاخەی** / wertaxey/: ناو. نیوەکارە؛ کاری مەزرا بە نیوەیی ▬ کار بر روی مزرعە بە صورت نیمە نیمە

**وەرتاسگە** / wertasge/: نـاو. بەرگـەدە؛ جێگــەی تووکەبەر ▬ زهار

**وەرتاق** / wertaq/: ☜ **وەرتاخ**

**وەرتاندن** / wertandin/: چاوگ. تلاندن؛ تلاندنەوە ▬ غلتاندن

**وەرتە**[1] / werte/: نـاو. ١. وەرت؛ ناوەڕاســت ٢. مافووری زل ▬ ١. وسط ٢. قالی بزرگ

**وەرتە**[2]: دەنگ. وتەی گەڕاندنەوەی گـا لـە خـەتی جووتدا ▬ کلمەی بازگرداندن گاو از خط شخم

**وەرتەگەنە** / wertegene/: چـاوگ. هۆرتـەکنای؛ قەڵاشتن؛ تلیشاندن ▬ شکافتن

**وەرتەوبەرە** / werte w bere/: ناو. بێنـە و بـەرە؛ گێرە و کێشە: ١. هاتوچۆی جووتیـار لـە کـاتی جووتدا ٢. *[مەجاز]* گیر و گرفـت ▬ ١. رفـتوآمـد کشاورز در حین شخم زدن ٢. گرفتاری

**وەرج** / werc/: ☜ **وەج**[1]

**وەرجا** / werca/: ☜ **وەرجە**

**وەرجسە** / werc(i)se/: نـاو. ١. بـزاو؛ جووڵــە ٢. هەڵبەز ـ دابەز؛ جرتوفرت ▬ ١. حرکت ٢. ورجـە ـ وورجە

**وەرجە** / werce/: ناوەڵکار. وەرجا؛ وەرز؛ لەمەوبـەر؛ بەر لە ▬ پیش از

**وەرچسە** / werç(i)se/: چاوگ. داچڵەکین؛ ڕاپەڕین لە نکاو ▬ یکّە خوردن

**وەرچنی** / werç(i)nî/: ناو. بەڕە؛ گڵێم؛ بەڕ ▬ گلیم

**وەرچەپین** / werçepîn/: چـاوگ. لادان؛ کلا بـوون ▬ مُنحرف شدن

**وەرچەرخان** / werçerxan/: چاوگ. وەرچـەرخین؛ زڤڕان؛ سووڕانەوە؛ بەرەودوا ڕوو کردن ‹وەرچەرخا تاریکیم/ ئەم شەوە شـەوێکی جیـاترە «شـێرکۆ»› ▬ ورچرخیدن

**وەرچەرخاندن** / werçerxandin/: چاوگ. زڤڕاندن؛ ڕوو بەرەو دوا کردنەوە ▬ چرخاندن

**وەرچەرخین** / werçerxîn/: ☜ **وەرچەرخان**

**وەرچەم** / werçem/: ناو. وەرە چەم؛ پێش چـاو ▬

منظره

**وەرخ** / werx/: ☜ **بەرخ ـ١**

**وەرخێزئاشۆ** / werxêz'aşo/: ئاوەڵناو. مایەفتنـەـ؛ ئاژاوەچی ☰ فتنه‌گر

**وەرد** / werd/: ناو. ١. کاری لە جارێ پتـر کـێلان ‹یەکێک سەرگەرمی شێوە ئێستەکانە، یەک خەریکی وەرد/ ئەوەی‌تریان خەریکە هەڵدەوێژێرێ لە کێڵگەی بەرد «هێمن»› ٢. شوێنی کێڵدراو؛ شـووکراو ‹لـە رێگە لامان‌دا بە ناو وەردا هـاتین› ٣. کـار و رەوتی ژێرورِوو کردنی خۆیانی بەرپێی گاگێرە ٤. [کنایە] دووپاتـە کردنـەوە ☰ ١. شـخم دوبـاره ٢. زمـین شـخم‌زده ٣. عمـل زیـرورو کـردن سـپاری درحـال کوبیدن ۴. تکرار

▣ **وەرد بـڕین:** کـێلانی زەوی ‹خـۆ تـۆ تـا ئێـوارە ئـەمری/ ئـەم شـێف و وەردە بـۆچ ئەبـڕی؟ «پیرەمێرد»› ☰ شخم زدن زمین

**وەرد دانەوە:** ١. لە جارێ پتر کێلان و گاسن لێ دان ‹بەهار هات وەردی دایەوە/ ماندوو بـوو پاڵـی دایـەوە «پیرەمێـرد»› ٢. [کنایە] پێداچوونـەوە؛ دووبارە پێدا هاتنەوە ‹... بیخوێنەوە! وردی بەوە! وەردی دەوە! ئەگەر بەهرەی پێ گەیاندی و شـتی باشـی تێگەیانـدی، ماڵـی ئـاوا ... «هـەژار، *چـوار ناميلکه*»› ☰ ١. زمین شخم شده را باز شخم زدن ٢. بازبینی کردن

**وەردانە** / werdane/: ☜ **وەردێنە ـ١**

**وەردایيش** / werdayîş/: چاوگ. ١. واردن؛ خواردن ٢. دەخوارد دان ٣. [کنایە] بەرتیل خواردن ☰ ١. خوردن ٢. خوراندن ٣. رشوه خوردن

**وەردش** / werdiş/: چـاوگ. ١. خـواردن ٢. خواردنەوە ☰ ١. خوردن ٢. نوشیدن

**وەردکەک** / werdkek/: ناو. چکۆلەیی؛ وردیلانـەیی ☰ کوچولویی

**وەردڵ** / werdił/: ☜ **بەردڵ**

**وەردۆخ** / werdox/: ☜ **واردۆخ**

**وەردۆک** / werdok/: ☜ **وەردەك ـ١**

**• وەردە** / werde-/: پاشەوشە. ـ کێشـاو؛ ـ خـواردوو ‹بە دڵەی پوڕدەرد هیجران‌وەردەوە/ بـە ئـاه دەروون ئایرکەردەوە «سەیدی»› ☰ ـ خورده

**وەردەس** / werdes/: ناو. پاکار؛ دەسیار؛ دەستیار ☰ پاکار؛ وردست

**وەردەک** / werdek/: نـاو. ١. وەردۆک؛ وەردەکـە؛ مراوی ٢. جیازی بووک ٣. چەورەی ماڵانگەڕ ☰ ١. اُردک ٢. جهیزیەی عروس ٣. طفیلی

**وەردەکە** / werdeke/: ☜ **وەردەك ـ١**

**وەردەن** / werden/: چاوگ. خواردن ☰ خوردن

**وەردەنە** / werdene/: ☜ **وەردێنە ـ١**

**وەردی** / werdî/: ئاوەڵناو. بچـۆک؛ بیچکەلانـە ☰ کوچولو

**وەردیان** / werd(i)yan/: ☜ **وردیان**

**وەردی‌مردی** / werdîmirdî/: ☜ **وردەواڵە**

**وەردێنک** / werdênik/: ناو. ١. ناوەنـد؛ کـروک ٢. ☜ **وەردێنە ـ١** ☰ ١. مرکز ٢. ☜ **وەردێنە ـ١**

**وەردێنکە** / werdênke/: ☜ **وەردێنە ـ١**

**وەردێنە** / werdêne/: نـاو. ١. وەردانـە؛ وەردەنـە؛ وەردێنکـە؛ وەردێنـک؛ نابوونیـک؛ نابووینـک؛ نابینـک؛ تیرەنـان؛ بـازی؛ کەسمەبـڕ؛ تیرۆکـی ئەسـتووری هـەویر پـان کردنـەوە ٢. جـۆرێ نەخۆشی چاوی زارۆکان ٣. گیایەکە بـۆ دەرمـان دەشێ ☰ ١. نوردەی نانوایی ٢. از بیماری‌های چشم کودکان ٣. گیاهی دارویی

**وەردێنەچی** / werdêneçî/: نـاو. تیری لێـدەر؛ ئـەو کەسـەی لـە نانەواخانـە وەردێنـە لـێ دەدا ☰ وردنه‌گر

**وەرز**[۱] / werz/: نـاو. ١. کـەژ؛ کـەژە؛ کـەش؛ کـژ؛ پشکسـاڵ؛ گۆنـەر؛ گۆنـەڵ؛ هەڤـرۆنگ؛ فەسـڵ؛ کژەساڵ؛ بەشێک لە چواربەشی ساڵ بـە هـەوای

تایبەت بە خۆیەوە کە سێ مانگە ‹وەرزی هاوین؛ وەرزی زستان› ٢. سەردەم؛ هەڕەت؛ ئەنگۆرە؛ گۆنگەڵ؛ هاڤرۆنگ؛ جەنگە؛ جەرگە؛ کانگە؛ تۆف؛ تاف؛ دۆخیان؛ هەڕەمە؛ چاخ؛ هنگ؛ وەگ؛ گۆنەر ‹وەرزی هەنار؛ وەرزی گولباخی› ٣. *[مەجاز]* ساڵ ٤. بێستانە دێم ٥. نۆرەی کێلانی زەوی ☰ ١. فصل ٢. موسم ٣. سال ٤. پالیز دیم ٥. نوبت کشت زمین

**وەرز**[٢]: ئاوەڵناو. بەرز؛ بڵند ☰ بلند

**وەرز**[٣]: ☜ **وەرجە**

**وەرزا** / werza/: ناو. وەرزە؛ گای جووت ☰ گاو شخم

**وەرزاخ** / werzax/: ناو. زەردومەاهـ؛ شاخی زۆر سەخت و ئەستەم ‹ها منیچ چوون بڵ نە وەرزاخەی چەم/ ئەسرین وێنەی تاف مەکنێۆ جە چەم «عەبدولوەهاب ئاریانی»› ☰ کوه سنگی بسیار سخت

**وەرزان** / werzan/: چاوگ. وەرزین؛ جووڵانەوە ☰ جنبوجوش کردن؛ ورزش کردن

**وەرزاندن** / werzandin/: چاوگ. جووڵاندن ☰ حرکت دادن

**وەرزانوەرز** / werzanwerz/: ناو. کاری ساڵ بوار کردن لە کێلانی زەوی یا لە چاندنی جۆری دەغڵ لە زەوینێکدا (وەک ئەوەی: ساڵێ بکرێتە گەنم، ساڵێ نۆک یا هەر نەکێلدرێ) ☰ آیش زمین

**وەرزانە** / werzane/: ئاوەڵکار. بە شێوەی وەرزی ‹ئەم گۆڤارە وەرزانە دەردەچێ› ☰ فصلی

**وەرزانەوە** / werzanewe/: چاوگ. جووڵانەوە ☰ حرکت کردن

**وەرزش** / werziş/: ناو. وەرزشت: ١. چالاکی بە بەرنامەوە بۆ بار هێنان و پاراستنی لەش ٢. کاری ڕاهێنان؛ ئەو کارەی بۆ ڕاهاتن و پاراستنی ژێهاتوویی دەکرێ ☰ ١و٢. ورزش

▣ **وەرزش کردن**: وەرزین ☰ ورزش کردن

**وەرزشت** / werzişt/: ☜ **وەرزش**

**وەرزشکار** / werzişkar/: ناو. وەرزشوان؛ لیزەڤان؛ یاریزان؛ ڕاهاتوو بە وەرزش ☰ ورزشکار

**وەرزشوان** / werzişwan/: ☜ **وەرزشکار**

**وەرزشی** / werzişî/: ئاوەڵناو. پێوەندیدار بە وەرزشەوە ‹کەوشی وەرزشی› ☰ ورزشی

**وەرزڤان** / werzvan/: ناو. ١. بێستانچی؛ بێستانەوان ؛ خاوەن یان ئاگاداری بێستان ٢. فێرکاری وەرزش ☰ ١. جالیزبان. ٢. مربی ورزش

**وەرزقورێف** / werzqurêf/: ناو. جەنگەی ڕنینی تەڕەکاری ☰ موسم چیدن ترەبار

**وەرزنامە** / werzname/: ناو. گۆڤارێ کە وەرزێ (سێ مانگ) جارێک دەردەچێ ☰ فصلنامە

**وەرزنای** / werznay/: چاوگ. ڕاهێنان ☰ بار آوردن

**وەرزولا** / werzûla/: ☜ **وەرژو**

**وەرزە** / werze/: ناو. ١. ☜ **وەرزا** ٢. بەرزایی؛ بڵندایی ☰ ١. ☜ **وەرزا** ٢. بلندی

**وەرزەبا** / werzeba/: ناو. بای باوی وەرزی ساڵ ☰ باد موسمی

**وەرزەباران** / werzebaran/: ناو. بارانی باوی وەرزی ساڵ ☰ باران موسمی

**وەرزەک**[١] / werzek/: ناو. بەرزەک؛ بڵندایی کەم لە ناو ڕاستاییدا ☰ بلندای کم در میان زمین هموار

**وەرزەک**[٢]: ئاوەڵناو. زانا لە ژمارەگەری و لێکدانەوە ☰ حسابدان

**وەرزەنایش** / werzenayş/: چاوگ. ١. هەڵساندن؛ هەڵێنان، بەرز کردنەوە ٢. دامەزراندن؛ ڕاست چەقاندن ٣. هەستاندن؛ لە خەو ڕاکردن ☰ ١. بُلند کردن ٢. نصب کردن ٣. از خواب بیدار کردن

**وەرزەنەک** / werzenek/: ناو. بەروانکە؛ بەروانک ☰ پیشبند کار

**وەرزی**[١] / werzî/: ناو. بەرزی؛ بڵندی ☰ بلندی

**وەرزی**[٢]: ئاوەڵناو. تایبەت بە وەرز ‹کاری وەرزی› ☰ فصلی

**وەرزیار** / werzyar/: ☜ **وەرزێر**

**وەرزیاری** / werzyarî/: ☜ **وەرزێری**

**وەرزیای** / werzyay/: چاوگ. ڕاهاتن ☲ بار آمدن

**وەرزین**[1] / werzîn/: چاوگ. ١. وەرزش کردن؛ جوولانەوە و خۆ ماندوو کردن ٢. لێکدانەوە؛ ڕاوە کردن ٣. لێکدانەوەی خەون ☲ ١. ورزش کردن ٢. تفسیر کردن ٣. تعبیر کردن خواب

**وەرزین**[2]: ناو. ١. نەرمەزین؛ ئارەقگیری بن زین ٢. بەرەی زین؛ قایش و قرووشی سنگی ئەسب ☲ ١. نمدزین ٢. سینەبند زین

**وەرزینەوە** / werzînewe/: چاوگ. جوولانەوە ☲ حرکت کردن

**وەرزێر** / werzêr/: ناو. وەرزیار؛ وەرزێڕ: ١. جووتێر؛ جووتبەندە ‹دەمێکە داسی ئەجەل تیژ ئەکا وەکوو وەرزێر/ خەریکی عالەمە پاکۆی ئەدا بە ڕیزە هەموو «بێخود»› ٢. خزمەتکار؛ کەسێ کە نانەزگ لەماڵێک دەژی و هەموو کارێک دەکا ☲ ١. کشاورز ٢. خدمتکار روستایی

**وەرزێری** / werzêrî/: ناو. وەرزێڕی؛ وەرزیاری: ١. جووتێری ٢. خزمەتکاری لە گوند ☲ ١. کشاورزی ٢. خدمتکاری در روستا

**وەرزێڕ** / werzêř/: ☜ **وەرزێر**

**وەرزێڕی** / werzêřî/: ☜ **وەرزێری**

**وەرژۆ** / werjo/: ☜ **وەرژوو**

**وەرژۆن** / werjon/: ناو. بەرەژان؛ ژانی پێش مناڵ بوون ☲ درد قبل از زایمان

**وەرژوو** / werjû/: ناو. وەرزوولا؛ لەپماڵ؛ وەرژۆ؛ مشتوماڵ؛ پەرخ؛ ماساژ؛ کاری شێلان؛ ولین؛ ولاین؛ بلین؛ قەمالین؛ مالینی ماسوولکە بە دەست یان هەر کەرستەیەکیتر بۆ دەرمان و لەشساخی ☲ ماساژ

**وەرسان** / wersan/: چاوگ. وەرسیان؛ وەرسین: ١. پسان ٢. بەر بوونەوە (ئاو و شاوەت و ...) ☲ ١. گسستن ٢. رها شدن

**وەرساندن** / wersandin/: چاوگ. ١. پچڕاندن؛ پساندن ٢. بەر دانەوە (ئاو و شاوەت و ...) ☲ ١. گسیختن ٢. رها کردن

**وەرسایی** / wersayî/: ئاوەڵناو. پچڕاو؛ پساو ☲ گسسته

**وەرسوڕ** / wersûř/: ناو. هەڵچەرخ؛ زڤر ☲ چرخش

**وەرسوڕان** / wersûřan/: چاوگ. وەرچەرخان ☲ ورچرخیدن

**وەرسووڕاندن** / wersûřandin/: چاوگ. وەرچەرخاندن؛ زڤڕاندن ☲ چرخاندن

**وەرسوڕانەوە** / wersûřanewe/: چاوگ. ڤەتلین؛ گەڕانەوە؛ گەڕیانەوە ☲ برگشتن

**وەرسە** / werse/: ناو. وەرسەلە؛ ماسوولکە؛ ماسوولە؛ مایچە؛ ماهیچە؛ لەملانە؛ زەبلەک ☲ عضُله

**وەرسەل** / wersel/: ناو. ئێسک؛ پێشەبەندی لەش ☲ استخوان

**وەرسەلە** / wersele/: ☜ **وەرسە**

**وەرسیان** / wers(i)yan/: ☜ **وەرسان**

**وەرسین** / wersîn/: ☜ **وەرسان**

**وەرشاو** / werşaw/: ☜ **وەرشەو**

**وەرشکست** / werş(i)kist/: ☜ **وەرشکستە**

**وەرشکستە** / werş(i)kiste/: ئاوەڵناو. وەرشکست؛ تێشکاو؛ تێکشکاو؛ تەختە؛ مایەپووچ؛ مایەپووت؛ ماڵکەتی؛ مافندی؛ مافنگی؛ دەملەپووش؛ شکسگەن؛ نابوود؛ دارایی لە دەسچووگ ☲ ورشکست

**وەرشۆ** / werşo/: ☜ **وەرشەو**

**وەرشەدار** / werşedar/: ☜ **ورشەدار**

**وەرشەق** / werşeq/: ☜ **وشەك**

**وەرشەک** / werşek/: ☜ **وشەك**

**وەرشەو** / werşew/: ناو. وەرشاو؛ وەرشۆ؛ قەرشە: ١. هەر ئالیاژێکی سپی بە ٤٦ تا ٦٣٪ مس، ٦ تا ٣٠٪

نیکڵ و ١٨ تا ٣٦٪ ڕۆح کە بۆ دروست کردنی سەماوەر، سینی، دەفر و ئامان و ئامرازی تیژ، کەڵکی لێ دەگرن ٢. پارچە کانزای ئاوکاریکراو کە ماشینی پێ دەڕازێننەوە ■ ١و٢. ورشو

**وەرفتن** / weriftin/: چاوگ. ١. ئاو لێچۆڕان ٢. دڵۆپە کردن ٣. *[مەجاز]* نابووت بوون ■ ١. آب از چیزی رفتن ٢. چکه کردن ٣. نابود شدن

**وەرڤان** / wervan/: چاوگ. تکان؛ تکین؛ چۆڕان ■ چکیدن

**وەرڤاندن** / wervandin/: چاوگ. ١. پالاوتن ٢. دڵۆپە کردن ٣. *[مەجاز]* دارایی بە هەدەر دان ■ ١. تصفیه کردن ٢. چکه کردن ٣. ثروت هدر دادن

**وەرڤین** / wervîn/: چاوگ. ١. تنۆک لێ دەلان ٢. *[مەجاز]* نابووت بوون ■ ١. نشت داشتن ٢. ورشکست شدن

**وەرقاس** / werqas/: ئاوەڵکار. ١. تا ئەندازەیەک ٢. ئەم ئەندازە ■ ١. تا اندازەای ٢. این اندازه؛ این‌قدر

**وەرقلاندن** / werq(i)landin/: چاوگ. ١. ڕاست چەقاندن ٢. ڕاگرتن بە پاوە ■ ١. عمود نصب کردن ٢. سر پا نگهداشتن

**وەرقیل** / werqîl/: ناو. ئالقەی دارین لە ڕەشکەی کلۆش گوازتنەوەدا ■ حلقەی چوبین انتهای طناب بارکشی

**وەرک** / werk/: ناو. بەرخ؛ وەرخ؛ وەر ■ برّه

**وەرکۆ** / werko/: ناو. بەرکوت؛ کاری کوتانی کولۆشی گەنم پێش گێرەی خەرمان ■ کار کوبیدن ساقەی گندم قبل از کوبیدن خرمن

**وەرکۆرپە** / werkorpe/: ناو. بەرخەساوا ■ برّەی نوزاد

**وەرکەردە** / werkerde/: ئاوەڵناو. ١. دەبەرکراو ٢. دەکارکراو (جل‌وبەرگ) ■ ١. پوشیده شده ٢. کارکرده (پوشاک)

**وەرکەمەر** / werkemer/: ناو. گیایەکی بۆنخۆشی کوێستانییە ■ گیاهی است

**وەرکەوتن** / werkewtin/: چاوگ. ١. ڕاکشان؛ پاڵ دانەوە ‹کاتی وەرکەوتن و وادەی کاوێژ/ بە مشە و مرخە و سروە و ڕاوێژ «حەقیقی»› ٢. *[کینایە]* خەوتن؛ خەفتن ‹لەو هەموو جانەوەرەی وەردەکەوێ/ نازەنینیش هەیە لای‌لایی دەوێ «هەژار، بۆ *کوردستان*»› ■ ١. دراز کشیدن ٢. خوابیدن

**وەرکەوەر** / werkewer/: ناو. ئەو بەردە لە کاتی بارین ئەچنە پەنای ■ سنگ پناهگاه باران

**وەرکی** / werkî/: ئاوەڵناو. تاک؛ ئاواڵە؛ کراوە؛ باز ■ باز

**وەرگ** / werg/: ناو. ١. گەڵای ڕووەک ٢. گور؛ گورگ؛ شینۆ ■ ١. برگ نباتات ٢. گُرگ

**وەرگا** / werga/: ناو. وێرەگا؛ وێرگا؛ ئێوار؛ ئێوارە ■ تنگ غروب

**وەرگان** / wergan/: ناو. گەلەگورگ ■ رمەی گرگ

**وەرگر**[١] / wergir/: ناو. ١. بەرگر؛ لەمپەر ‹کێ وەرگرتە نەخوێنی و نەبی بە شت؟› ٢. کەسێ کە شتێک ئەگرێ ‹وەرگری بەرتیل، ئەخرێتە بەر میل «مەسەل»› ■ ١. مانع ٢. گیرنده

**وەرگر**[٢]: ئاوەڵناو. قایم و خۆڕاگر ■ بادوام

**• وەرگر**[٣]: پاشوشە. تایبەتمەندی شتێ یا کەسێ کە وەردەگرێ ‹کەڵکوەرگر؛ بەرتیل‌وەرگر› ■ ـ گیر

**وەرگرتن** / wergirtin/: چاوگ. ١. سەندن؛ سەنن ‹لە هەر ڕەنگێکیان غەمێک وەرگرین/ بە هەر غەمێکی تێر و پڕ بگرین «پیرەمێرد»› ٢. گوێ ڕاگرتن بۆ قسە و قبووڵ کردنی ‹تا لە چاوی مورشیدی تۆ بەیعەتم وەرگرتووە/ ڕۆژ و شەو مەجزووبی حەوشی خانەقاتم، ڕۆحەکەم! «بێخود»› ٣. بەر گرتن؛ بەرگە گرتن ٤. پەزیران؛ ڕێ دان بۆ کار یان شوێنێ ■ ١. گرفتن ٢. گوش کردن ٣. دوام آوردن ۴. پذیرفتن

**وەرگرتنەوە** / wergirt(i)newe/: چاوگ. ساندنەوە (وام یان ئامانەتی) ■ بازپس گرفتن (وام یا امانت)

**وەرگە**[1] / werge/: ناو. بەرگە؛ خۆڕاگری؛ تاقەت ≡ تاب؛ تحمل

**وەرگە**[2]: ئاوەڵکار. ئاوەها؛ ئابەمجۆرە ≡ این‌طور

**وەرگەڕ** / wergeř/: ☜ **وەرگێڕ**[1]

**وەرگەڕان** / wergeřan/: چاوگ. ١. وەرچەرخان؛ زڤڕان؛ بەرەو شوێنی پێشوو ڕۆیشتنەوە ‹وەرگەڕێ بالات ببینم/ جا دەرچێ گیانی شیرینم «پیرەمێرد»› ٢. هەڵەوگەڕیان؛ سەرنخوون بوون ‹دوکتور دەوای تۆم ناوێ، لێمگەڕێ!/ بەڵکم بە ئاهم دەوران وەرگەڕێ! «پیرەمێرد»› ٣. لە جێ چوونی بەندی ئەندام ‹شەو لە نزیک چوارقوڕنە، جیپ دە قوڕ گیرا و بە تاریکی بە ڕێدا دەهاتین. لاقم دە قولکەیەک کەوت و وەرگەڕا «هەژار، چێشتی مجێور»› ٤. *[مەجاز]* هەڵەوگەڕیان؛ دەست هەڵگرتن؛ پشت لێ کردن ‹لە باوکی وەرگەڕاوە› ٥. (لە دین) دەرچوون ٦. گۆڕان؛ بارەوبار بوون ‹دۆخەکە تەواو وەرگەڕا› ٧. ☜ **وەرگێڕان** ≡ ١. چرخ خوردن ٢. واژگون شدن ٣. از جا دررفتن بند اندام ۴. برگشتن ۵ (از دین) خارج شدن ۶ تغییر کردن ٧. ☜ **وەرگێڕان**

**وەرگەڕاندن** / wergeřandin/: چاوگ. چەرخاندن؛ ژێروڕوو کردن. هەروەها: **وەرگەڕاندنەوە** ≡ زیرورو کردن

**وەرگەڕانەوە** / wergeřanewe/: چاوگ. ١. گەڕانەوە؛ گەڕیانەوە؛ هەڵەوگەڕیان ٢. لە بەرانبەر گەورەتردا ڕاوەستان ≡ ١. برگشتن ٢. در مقابل از خود بزرگتر ایستادن

**وەرگەڕاو** / wergeřaw/: ئاوەڵناو. ١. ژێروڕوو کراو؛ چەرخ پێ دراو ٢. لە دین دەرچوو ٣. ☜ **وەرگێڕاو** ≡ ١. زیرورو شده ٢. مُرتد ٣. ☜ **وەرگێڕاو**

**وەرگەشەوێ** / wergeşewê/: ناو. گورگانەشەوێ؛ گوریەشەوێ؛ وتەیەکە بۆ خەواندنی منالان دەیڵێن ≡ نوعی لالایی

**وەرگەوەران** / wergeweran/: ناو. دوژمنی گیانی ‹بوونە وەرگەوەرانی یەکتر› ≡ دشمن خونی

**وەرگیران** / wergîran/: چاوگ. ١. گیریان؛ ڕێ پێ دران ‹لە زانکۆ وەرگیراوە› ٢. ڕاگیران بۆ دوایی ٣. هەڵگیران؛ لە شوێن یان شتێکەوە هەڵبژاردن ‹لە یەسکی رزیو وەرناگیرێ کاو/ بێ‌کار دژوارە ژینی ژن و پیاو «هێمن»› ≡ ١. پذیرفته شدن ٢. نگهداشته شدن برای آتیه ٣. برگرفتن

**وەرگیراو** / wergîraw/: ئاوەڵناو. پەزیراو ≡ پذیرفته

**وەرگێڕ**[1] / wergêř/: ناو. وەرگەڕ؛ دیلماج؛ پاچڤەکار؛ کەسێ کە زمانێک بۆ زمانێکی تر وەردەگێڕێ ≡ مُترجم

**وەرگێڕ**[2]: ئاوەڵناو. وەرگێل: ١. تایبەتمەندی کەسێ کە کاری وەرگێران بێ ٢. ژێروڕوو کەرەوە ٣. تایبەتمەندی کەسێ کە شتێک هەڵدەگەڕێنێتەوە ≡ ١. برگرداننده ٢. زیرورو کننده ٣. برگرداننده

**وەرگێڕ**[3]: پێرۆ. ← **هەڵگێڕ و وەرگێڕ**

**وەرگێڕان** / wergêřan/: چاوگ. وەرگەڕان؛ وەرگێڕانەوە؛ وەرگێلان: ١. پاچڤە کردن ٢. ئاوەژوو کردن؛ ژێروڕوو کردن؛ وەرگەڕان ‹گوتمان با بچینە لای خەیاتێک، یەخەکەمان بۆ وەرگێڕێ «هەژار، چێشتی مجێور»› ٣. وەرچەرخاندن؛ هەڵگەڕاندنەوە ‹من ئەو سێبەرەم دوامکەوی ئەڕۆم/ ڕووم لێ وەرگێڕی من لە شوێنی تۆم «پیرەمێرد»› ≡ ١. ترجمه کردن ٢. برگرداندن ٣. چرخاندن

**وەرگێڕانەوە** / wergêřanewe/: ☜ **وەرگێڕان**

**وەرگێڕاو**[1] / wergêřaw/: ناو. وەرگەڕاو؛ پاچڤە ≡ ترجمه

**وەرگێڕاو**[2]: ئاوەڵناو. وەرگەڕاو: ١. هەڵگەڕاوە؛ ژێروڕوو کراو ٢. پاچڤەکراو ‹قورئانی وەرگێڕاوی مامۆستا هەژار› ≡ ١. زیر و رو شده ٢. ترجمه‌شده

**وەرگێڕک** / wergêřik/: ناو. ئامرازی ئاگر پێ سەروژێر کردن و هەڵگەڕاندنەوە ≡ انبُر

**وەرگێڕکە** / wergêřke/: ☜ **وەروێڕکە**

**وەرگێڵ** / wergêł/: ☜ **وەرگێڕ**[٢]

**وەرگێڵان** / wergêłan/: ☜ **وەرگێڕان**

**وەرم** / werm/: ناو. خەو؛ نفس ‹نازداران بە خەشم غەزەب گرتەن لێم/ بێ وەرمی شەوان بیەن بە خەدێم «بێسارانی»› ≡ خواب

**وەرما** / werma/: ناو. ئەشکەوت ≡ غار

**وەرماس** / wermas/: ناو. ئاسک؛ مامز ≡ آهو

**وەرمان** / werman/: چاوگ. ١. دامان؛ سەرگەردان بوون ٢. دواکەوتن؛ لە دواوە هاتن ٣. پەنەمان؛ ئەستوور بوون ≡ ١. واماندن ٢. عقب ماندن ٣. ورم کردن

**وەرماوی** / wermawî/: ئاوەڵناو. خەواوی؛ خاواڵین؛ خەواڵوو ≡ خوابآلود

**وەرمن** / wermin/: ئاوەڵناو. خەواڵوو ‹دیدەن دیدار غەزاڵەی وەرمن/ چی دما یاران وەرمەن پەرێ من «مەولەوی»› ≡ خوابآلود

**وەرمەڕ** / wermeř/: ناو. بەری ئەشکەوت ≡ جلوی غار

**وەرمەکی** / wermekî/: ناو. ساوا؛ بەبە؛ منداڵی مرۆڤ تا چل ڕۆژ پاش لە دایک بوون ≡ نوزاد

**وەرنما** / wern(i)ma/: ناو. پێشنوێژ؛ بەرنوێژ؛ ئیمام ≡ پیشنماز

**وەرنە** / werne/: ئاوەڵکار. دەنا؛ ئەگەر نە ‹مەجنوونی گەردی ناقەیی لەیلایە، وەرنە بۆچ/ وەک چاوی من هەمیشە لە شوێن کاروانە دڵ؟! «بێخود»› ≡ وگرنه

**وەرنەوسانە** / wernewsane/: ناو. پرووشەی خواردن بەر لە شیو هێنان ≡ پیشغذا

**وەرنیسک** / wernîsk/: ناو. بەرەنێسکێ؛ نزگەرەی گریان ≡ سکسکەی گریه

**وەرواس** / werwas/: ☜ **وەسواس**

**وەرواوی** / werwawî/: ناو. بەفراو ‹پەی لانساران خاڵ خاڵش وەشەن/ وەرواوی شیرین لاپاڵش وەشەن «سەیدی»› ≡ برفاب

**وەروڕێک** / werwiřêk/: ☜ **وەروێڕکە**

**وەروە**[١] / werwe/: ناو. بەفر؛ بەرف؛ وەر؛ وەرب ≡ برف

**وەروە**[٢]: ئاوڵکار. بەر بە؛ ڕوو بە شوێنێ ≡ رو به جایی

**وەروەر** / werwer/: ناو. جۆرێ دەمانچەی کۆنە ‹بە کەم مەگرە سروشک و ئاه و ناڵەی بێنەوایانت/ کە سەیلی بێئەمانە، تیری دڵدۆزە، گوڵەی وەروەر «مەحوی»› ≡ نوعی هفتتیر قدیمی

**وەروەرە** / werwere/: ناو. وەروەماڵ؛ شاپاڵۆخ؛ شاپاڵۆغ؛ بەفرەڵۆ ≡ برفروب

**وەروەماڵ** / werwemał/: ☜ **وەروەرە**

**وەروەوە** / werwewe/: ناو. بەرئێخە؛ پێسیر ≡ گریبان

**وەروێرکە** / werwêrke/: ناو. شادیک؛ وەرێرک؛ دڵخۆشکەرەی خێزان ≡ کودک مایەی دلخوشی خانواده

**وەروێڕک** / werwêřk/: ☜ **وەروێڕکە**

**وەروێڕکە** / werwêřke/: ناو. وەرگێڕکە؛ وەروڕێک؛ وەروێڕک؛ وروێڕکە؛ وەڕێڕک؛ وەڕێڕکە: ١. منداڵی فێرە ڕۆیشتن ٢. منداڵی بەکەیف و قسەشیرین ٣. منداڵێ کە کاری پێ بکرێ ≡ ١. کودک پاگرفته ٢. کودک رشد کرده و سرحال ٣. بچەای که قادر به انجام کار باشد

**وەرە**[١] / were/: ناو. ١. بەرەی زین ٢. بەرخ ≡ ١. سینەبند زین ٢. بره

**وەرە**[٢]: کاری فەرمان. بێ؛ بەو؛ باو (**تێبینی**: ئەم وشە چاوگی ڕاستەوخۆی نییە) ‹وەرە یارم! وەرە ئەی تازەیارم!/ وەرە ئەستێرەکەی شەوگاری تارم «هێمن»› ≡ بیا

**وەرەبیایش**[١] / wereb(i)yayş/: ناو. نەخۆش بە تێکچوون و ئێشی سپڵ ≡ بیمار دارای نارسایی طحال

**وەرەبیایش**[٢]: ئاوەڵناو. کز و کەنەفت ≡ زرد و ضعیف

**وەرەتاو** / weretaw/: ناو. هەتاو؛ خۆرەتاو ☰ آفتاب

**وەرەچەم** / wereçem/: ناو. ئاسۆگا؛ دیمەن؛ چاوەناز ☰ چشم‌انداز

**وەرەزەن** / werezen/: ناو. ١. تەرە؛ کاری داپۆشینی تووتن و شتی‌تر بۆ ئەوە بگات ٢. مشتاغ؛ جێ هەڵخستنی میوە ☰ ١. عمل پوشاندن برگ توتون و دیگر محصولات برای رسیدن آن ٢. جای خشک کردن میوە

**وەرەستا** / weresta/: ناو. ١. ماڵی مەوقووفە ٢. کۆمەگیی فەقێ لە ماڵی مەوقووفە ☰ ١. اموال وقف ٢. کمک هزینەی طلبه از اموال موقوفه

**وەرەق** / wereq/: ناو. ١. لاپەڕە؛ پەڕەکاغەز ٢. بەچکەی دووڕەگەی سەگی نێر و تاژی مێوینە ٣. خووس؛ خووسار؛ زوقم ٤. پاسوور؛ پەڕی قومار ٥. وەرەک؛ دڕکی دەشت ٦. تەڵش؛ پەڕەکانزا؛ کانزای وەک کاغەز پانەوە کراو ☰ ١. ورق کاغذ ٢. تولەی دورگە از سگ نر و تازی مادە ٣. پژ؛ سرماریزه ۴. ورق بازی ۵. خار بیابان ۶. ورق فلزی

⊡ **وەرەق هەڵگەڕانەوە**: /کنایە/ وەرەق هەڵگەڕانەوە/ هەڵەوگەڕیان؛ بار گۆڕیان؛ ئاڵوگۆڕ بە سەردا هاتنی بارودۆخ ‹هەر کە کوودەتا کرا و وەرەق هەڵگەڕایەوە، ناچار بوو بە شەودا ڕاکا› ☰ ورق برگشتن

**وەرەقە** / wereqe/: ناو. ١. پەڕەکاغەز ٢. دار و پەردووی ڕووخاو ٣. کارتێ کاغەزی کە ناونیشانێکی بە سەرەوەیە ‹وەرەقەی سەروازی› ☰ ١. ورق کاغذ ٢. آوار ٣. کارت

**وەرەک** / werek/: ناو. وەرەک؛ پنجە دڕکی دەشت ☰ خاربن بیابان

**وەرەگا** / werega/: ☜ **وێرەگا**

**وەرەگەیرایش** / weregeyrayş/: ناو. ١. بیربلاوی ٢. دڵتەنگی و ماتی ☰ ١. پریشانی افکار ٢. دلتنگی

**وەرەم** / werem/: ناو. وەرهەم؛ پەنەم؛ پەنام ‹پرسیم: ئەی هەڵەم، دانەت بێ‌هەڵەم/ بۆچ زەرد هەڵگەڕای بە دەردی وەرەم؟ «پیرەمێرد»› ☰ ورم؛ آماس

**وەرەمان** / wereman/: چاوگ. پەنەمان؛ ئاوسان؛ ماسان ☰ ورم کردن

**وەرەمدا** / weremda/: ناو. ١. سیل؛ دیق ٢. سیار؛ دیقاوی؛ ژانازراڤ‌کەتی ☰ ١. بیماری سل ٢. مسلول

**وەرەمدار** / weremdar/: ناوەڵناو. وەرهەم‌کردوو ☰ مسلول

**وەرەمن** / weremin/: ناوەڵناو. پەنەماو ☰ ورم‌کرده

**وەرەمەمکی** / werememkî/: ناوەڵناو. بەرمەمکان ☰ شیرخواره

**وەرەمی** / weremî/: ناوەڵناو. ١. ئاوساو؛ پەنەماو ٢. سیلدار؛ ژانازراڤ‌کەتی ☰ ١. ورم‌کرده ٢. مسلول

**وەرەمین** / weremîn/: چاوگ. ١. ئاوسان؛ وەرەمان ٢. تووشیاری سیل بوون ☰ ١. ورم کردن؛ آماسیدن ٢. مسلول شدن

**وەرە ـ وەرە** / were were/: ناوەڵکار. کەمە ـ کەمە؛ بەرە ـ بەرە ☰ اندک ـ اندک

**وەرەی ئامایش** / werey amayîş/: چاوگ. ١. تێگەیشتن؛ هاتنە سەر ڕێ ٢. ئاشت کردنەوە ٣. سازدان؛ پێک‌هێنان ☰ ١. فهمیدن؛ سر عقل آمدن ٢. آشتی کردن ٣. فراهم آوردن

**وەرهاتن** / werhatin/: چاوگ. تێ‌ڕۆهاتن و ڕاماڵین ‹لە حاڵێکدا لە سەرەوە، لە لووتکەکان/ تۆف و زریان لە دەوەن و داران وەردێن/ لە بنەوە لە دۆڵەکان، گیای نەوخێزە و گۆپکە دەردێن «پەشێو»› ☰ مالیدن؛ پایمال کردن

**وەرهان** / werhan/: ناو. بەران؛ وەران؛ نێرەپەز ☰ قوچ؛ گوسفند نر

**وەرهەم** / werhem/: ناو. ١. وەرەم؛ پەنام ٢. نەخۆشی بەرهەنگ ‹دیق و زەردۆیی و ئاهۆ و وەرهەم/ بە گزەی بای بەقەوەت دێن بەرهەم «سوارە»› ٣. بەرهەم؛ بەهرەی زەوی و سەودا ☰

۱. ورم ۲. نوعی بیماری کُشنده ۳. محصول؛ درآمد

⊡ **وەرهەم پێدان:** [کنایە] وەرهەم دان؛ چەرمەسەری دان ☰ خون به جگر کردن

**وەرهەم کردن:** ۱. پەنەمان؛ پەنەمیان ۲. [کنایە] زۆر وەڕەز بوون ☰ ۱. ورم کردن ۲. سخت ناراحت شدن

**وەرهەم هەڵێنان:** هەڵماسین؛ باکردن ‹تەلار و سەرسەرا و کۆشک چ دێنێ/ کە کوێلە وەرهەمی تێدا هەڵێنێ؟ «هێمن»› ☰ آماس آوردن

**وەرهەمکردوو** / werhemkirdû/: ئاوەڵناو. وەرەمدار؛ تووشیاری نەخۆشی سیل ☰ مسلول

**وەرهین** / werhîn/: چاوگ. داوەرین؛ وەرین ☰ فروریختن

**وەرهێنان** / werhênan/: چاوگ. وەرێنان؛ ئاوقا کردن؛ خستنە دەور ‹دەست لە قەدی یەک وەردێنن/ ڕیشەی ئیستیعمار دەردێنن «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ حلقه کردن

**وەرهێوانە** / werhêwane/: ناو. باڵەخانە؛ بەرهێوان ☰ رواق

**وەری** / werî/: ئاوەڵناو. بەری؛ دوور ☰ بری

⊡ **وەری بوون:** بەری/ بێوەری بوون؛ دوور بوون ☰ مُبرا بودن

**وەریا** / werya/: ئاوەڵکار. بەم جۆرە؛ ئا بەم شێوە ☰ به این نحو

**وەریان** / weryan/: چاوگ. وەرین؛ داوەرین؛ ڕژان لە سەرەوە ‹میوە وەری؛ خۆڵ وەری› ☰ ریزش کردن

**وەریای** / weryay/: ئاوەڵناو. داوەریو ☰ ریزش‌کرده

**وەریس** / werîs/: ☜ **وەرێسە**

**وەرین**[1] / werîn/: چاوگ. تێنەپەڕ. //وەریت؛ دەوەری؛ بوەرە// داوەرین؛ ڕەیین؛ لە سەرەوە ڕژانە خوار ‹باخەوانانی جیهان! پێم ناڵێن/ بۆ وەری میوەیی کاڵم؟ تا کەی؟ «هێمن»› ☰ ریزش کردن؛ ریختن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: وەریو/ چاوگی نەرێنی: نەوەرین

**وەرین**[2]: ئاوەڵناو. وەرێ؛ بەرین؛ پێشوو؛ بەرگین ‹ئەر شەرت و ئیقرار وەرین مەندەن پێت/ دیدەی ئینتزار من ئانا نە ڕێت «سەیدی»› ☰ پیشین

**وەرینان** / werînan/: جێناو. رابوردوان؛ پێشینان ‹هەرچی ویەردەن مەبۆ بواچان/ دیمان نەدیمان وەرینان ماچان «میرزا شەفیع پاوەیی»› ☰ گذشتگان؛ پیشینیان

**وەرینک** / werînik/: ناو. بەروانکە؛ بەروانک ☰ پیشبند کار

**وەرینە** / werîne/: ☜ **وڕاوە**

**وەریو**[1] / werîw/: ئاوەڵناو. داوەریو؛ داکەوتوو ‹میوەی وەریو هەڵمەگرنەوە!› ☰ ریخته

• **وەریو**[2]: پاشەوشە. داوەریو ‹پەڕوەریوی، باڵشکاوی دەنگ‌براو/ بێ‌بژیوی بەش‌خوراوی دەرکراو «هێمن»› ☰ فروریخته

**وەرێ** / werê/: ☜ **وەرین**[2]

**وەرێس** / werês/: ☜ **وەرێسە**

**وەرێسە** / werêse/: ناو. وەریس؛ وریس؛ وەرێس؛ گوریس ☰ ریسمان

**وەرێشک** / werêş(i)k/: ناو. سێ؛ سێپەلاک؛ سیپەلک ☰ شُش

• **وەرێن** / -werên/: پاشەوشە. ۱. داوەرێنراو ‹باوەرێن› ۲. داوەرێن ‹زوقوموەرێن› ☰ ۱. ـ ریخته ۲. ـ ریز

**وەرێنان** / werênan/: ☜ **وەرهێنان**

**وەرێنە** / werêne/: ناو. جۆرێ نەخۆشی چاوی زارۆکان ☰ نوعی بیماری چشم کودکان

**وەڕ**[1] / weř/: ناو. بەڕە؛ بەڕ ☰ پلاس

**وەڕ**[2]: دەنگ. حەپەی سەگ ‹سەگوەڕ› ☰ واق

**وەڕاز** / weřaz/: ناو. گۆخڵ؛ زانا لە چەڵتووک چاندندا ☰ شالیکار خبره

**وەڕازێن** / weřazên/: ناو. جوانکەر؛ ڕازێنەر؛ ڕازێنەوە

🇮🇷 آرایشگر

**وەڕاندن** / weřandin/: چاوگ. وەڕین؛ حەپە کردن 🇮🇷 پارس کردن

**وەڕز** / weřiz/: ☜ وەڕەز

**وەڕس** / weřis/: ☜ وەڕەز

**وەڕست** / weřist/: ☜ وەڕەز

**وەڕشان** / weř(i)şan/: چاوگ. وەڕشیان؛ وەڕشین؛ ڕشانەوە؛ هەڵهاوردنەوە 🇮🇷 قی کردن

**وەڕشاندن** / weř(i)şandin/: چاوگ. ڕشاندنەوە 🇮🇷 وادار کردن به استفراغ

**وەڕشاو** / weř(i)şaw/: ئاوەڵناو. ڕشاوەوە 🇮🇷 قی‌کرده

**وەڕشیان** / weř(i)şyan/: ☜ وەڕشان

**وەڕشین** / weř(i)şîn/: ☜ وەڕشان

**وەڕگ** / weřg/: ناو. فرۆ؛ ژەک و شیری پێکەوە کوڵاو 🇮🇷 از لبنیات

**وەڕنان** / weřnan/: چاوگ. ئاویتن؛ فڕێدان بە قەو 🇮🇷 پرت کردن

**وەڕوەڕ** / weřweř/: ناو. دەمانچەی شاکوژ 🇮🇷 نوعی کلت کوچک

**وەڕوەڕە** / weřweře/: ناو. ڕەوڕەوە؛ چەرخی پاگرتنی منداڵ 🇮🇷 روروک

**وەڕە**[1] / weře/: ناو. گەڵای ڕوەک 🇮🇷 برگ نباتات

**وەڕە**[2]: دەنگەناو. حەپە؛ گەفەی سەگ 🇮🇷 پارس سگ

**وەڕەز** / weřez/: ئاوەڵناو. وارز؛ وەڕز؛ وەڕس؛ وەڕست: ١. جاڕز؛ یاس ‹وەڕەز بوو گیانی من لە شار و هارەهارەی ئەو/ لە ڕۆژی چڵکنی نەخۆش و تاو و یاوی شەو «سوارە»› ٢. پەکەر؛ داگیراو؛ بێ‌کەیف ‹لە خۆیەوە وەڕەزە، نازانم لە بەر چی›. هەروەها: **وەڕەز بوون؛ وەڕەز کردن** 🇮🇷 ١. بیزار ٢. پریشان

**وەڕەزی** / weřezî/: ناو. پەکەری؛ قەبزی؛ قەڵسی 🇮🇷 بیزاری

**وەڕەزیشکێن** / weřezîş(i)kên/: ئاوەڵناو. هەوی؛ مایەی خلافاندن و خەریک کردن 🇮🇷 سرگرم‌کننده

**وەڕەق** / weřeq/: ناو. خووسار؛ خوێز؛ خوێس 🇮🇷 پـژ؛ سرماریزه

**وەڕەک** / weřek/: ☜ وەڕەکینا

**وەڕەکنا** / weřekna/: ☜ وەڕەکینا

**وەڕەکینا** / weřekîna/: سارستە. وەڕەک؛ وەڕەکنا؛ خۆزگا؛ خۆزی 🇮🇷 کاشکی

**وەڕەنگ**[1] / weřeng/: ئاوەڵناو. بەرەنگ‌وڕوو ‹مانگا زەرد یەکجار وەڕەنگە› 🇮🇷 خوش آب‌ورنگ

**وەڕەنگ**[2]: ئاوەڵکار. بەوجۆرە؛ هاکا؛ ئاوها 🇮🇷 این چنین

**وەڕەوەڕ**[1] / weřeweř/: دەنگەناو. حەپەحەپ؛ وەڕەی لە دووی یەک 🇮🇷 واق واق سگ

**وەڕەوەڕ**[2]: دەنگ. [پلار] فەرمان بە بێدەنگ بوون ‹دە وەڕەوەڕ!› 🇮🇷 خاموش!

**وەڕیڕی** / weřîřî/: ناو. ڕووبەڕوو 🇮🇷 روبرو

**وەڕین** / weřîn/: چاوگ. حەپەحەپ کردن 🇮🇷 پارس کردن

**وەڕیو** / weřîw/: ئاوەڵناو. گەفیو؛ حەپەحەپ کردوو 🇮🇷 پارس‌کرده

**وەڕێ** / weřê/: ناو. بەڕ؛ بەڕە 🇮🇷 گلیم

**وەڕێخەر** / weřêxer/: ئاوەڵناو. سازێنەر؛ ڕێکخەر 🇮🇷 سازنده

**وەڕێڕک** / weřêřik/: ☜ وەرویڕکە

**وەڕێڕکە** / weřêřke/: ☜ وەرویڕکە

**وەز**[1] / wez/: ناو. ١. بەز؛ چەوری ناوزگ ٢. گوێز 🇮🇷 ١. پیه ٢. گردو

**ـ وەز**[2]: پاشەوشە. ١. ـ بەز؛ تێپەڕ ‹خۆش‌وەز› ٢. هەڵکرد ‹سەرماوەز› 🇮🇷 ١. ـ رَو؛ ـ تاز ٢. ـ وز

**وەزا** / weza/: ئاوەڵناو. ١. لاواز؛ داڵگۆشت ٢. بێچارە؛ بەستەزمان 🇮🇷 ١. لاغر ٢. بیچاره

**وەزار** / wezar/: ئاوەڵناو. زارەکی؛ سەرزارەکی؛ دەمی؛ بە دەم 🇮🇷 شفاهی

**وەزارەت** / wezaret/: ناو. ١. وەزیری؛ شالیاری؛ کار و پلەی وەزیر ‹حوکم و فەرمانی وەزارەت دەرکەوت/

شەرعەن حەرامە لەش‌پیس لە مزگەوت! «پیرەمێرد»» ٢. وەزارەتخانە ‹وەزارەتـی کشـتوکـاڵ› ☰ ١و٢. وزارت

**وەزارەتخانـــــە** / wezaretxane/: نـــــــاو. ١. دامەزراوەیەکی دەوڵـەتی کـە لـە ژێـر چـاودێری وەزیرێکدا بەڕێوە دەچێ ٢. یانـەی ناوەنـدی ئـەو دامەزراوەیـە کـە شـوێنی کـاری وەزیـرە ☰ ١و٢. وزارتخانە

**وەزارەتی** / wezaretî/: ئاوەڵناو. سـەر بـە وەزارەت ‹دەزگای وەزارەتی› ☰ وزارتی

**وەزان** / wezan/: ☜ **وەزین**

**وەزانی** / wezanî/: ناو. گوێزان؛ گوێزێن ☰ گردوبازی

**وەزتـــەکنـــان** / wezteknan/: نـــاو. خەزەڵـــــوەر؛ گەڵاڕێزان ☰ آبان

**وەزم** / wezm/: ☜ **وزم**

**وەزمە** / wezme/: ☜ **وسمە**

**وەزن** / wezn/: نـاو. ١. کـێش؛ قورسـایی؛ سـەنگ؛ سـەنگینی؛ گـرانی؛ گرانـایی ٢. هەڤـدەن؛ ڕەوت؛ کێشی شێعر؛ ژمارەی بڕگە لـە شـێعرێکدا ٣. ☜ **وەزەند** ٤. ئێش و ئـازار ☰ ١. وزن؛ سـنگینی ٢. وزنِ شعر ٣. ☜ **وەزەند** ٤. درد؛ آزار

**وەزنایرە** / weznayre/: چاوگ. داوەزانـدن ☰ پیـادە کردن

**وەزند** / wezind/: ☜ **وەزەند**

**وەزنـــدار** / wez(i)ndar/: ئاوەڵـــناو. ١. ســـەنگین؛ بەکێش ٢. *[کینایە]* ماقووڵ و بەوەج ☰ ١. سنگین ٢. مُحترم

**وەزنـە** / wezne/: نـاو. ١. ســەنگ؛ کێشـــانە ٢. کێشانەیەکە بەرانبەر بـە سـەد کیلـۆ ☰ ١. وزنـە ٢. وزنەی صد کیلوگرمی

**وەزنی** / weznî/: ☜ **وەزەند**

**وەزو** / wezû/: ☜ **وازو**

**وەزە** / weze/: ناو. ١. ڕەوتی پێـوەدان؛ چـزوو تێـڕۆ کـردن ٢. نەخۆشـییەکی زاری زارۆکانـە ٣. وزە؛ تابشت ☰ ١. گزش ٢. نوعی بیماری دهان کودکان ٣. تاب؛ یارا

**وەزەرای** / wezeray/: چاوگ. ١. داخۆزین؛ دابـەزین ٢. هاتنە خوار ☰ ١. پیادە شدن ٢. پایین آمدن

**وەزەقاڵانی** / wezeqałanî/: ناو. گـوێزان؛ گـوێزێن؛ کایەی بە گوێزان ☰ گردوبازی

**وەزەمـەژگلێ** / wezemejg(i)łê/: نـاو. گیایەکـــە ئەخورێ ☰ گیاهی خوردنی

**وەزەن** / wezen/: نـاو. وەزەنـگ؛ ئـازار؛ عەزیـەت ‹نزامان لێ قبووڵ کرد و وەزەنمان لـە سـەری لابـرد «هەژار، *قورئان*»› ☰ گزند

▣ **وەزەن بون** زیان هەبوون ☰ گزند/ آزار داشتن

**وەزەند** / wezend/: ناو. وەزن؛ وەزند؛ وەزنی؛ پشتاو؛ دەفری بارووتی ڕاوکەر ☰ ظرف باروت شکارچی

**وەزەنگ** / wezeng/: ☜ **وەزەن**

**ـ وەزەنی** / wezenî/: پاشەوشە. ـ ئـازاری ‹هاوسا وەزەنی› ☰ ـ آزاری

**وەزەوان** / wezewan/: ئاوەڵـناو. گـوێزەوان؛ توانـا لـە سەرکەوتن و پێ‌هەڵچوونی دار گوێزاندا ☰ ماهر در بالا رفتن از درخت گردو

**وەزەوای** / wezeway/: ناو. جۆرێ کولێرە کە گوێزی وردی تێدایە ☰ نوعی گردەی نان حاوی مغز گردو

**وەزی** / wezî/: ناو. گوێز؛ قۆز؛ گیز ☰ گردو

**وەزیر** / wezîr/: نـاو. ١. شـاریار؛ شـالیار؛ بەرپرسـی وەزارەت و ئەنـدامی کابینـەی دەوڵـەت ‹گـەدایی بارەگاهی ئەو، ئەگەر ئەمیر، ئەگەر وەزیر/ فیدایی عیـزز و جاهی ئەو، ئەگەر غەنی، ئەگەر فـەقیر «بێخـود»› ٢. فەرز؛ فەرزین؛ مۆرەیەکی شەترەنج کە بـە هـەموو لایەکدا دەتوانێ ببزوێ و هەر یاریکەرێک یەکێکی هەیە ☰ ١و٢. وزیر

**وەزیری** / wezîrî/: نـاو. ١. کـار و پلـەی وەزیـر ٢. جۆرێ هەنجیر ☰ ١. وزارت ٢. نوعی انجیر

**وەزیفە / wezîfe/**: ناو. ١. ئەرکی سەرشان ٢. مووچە؛ جیرەنانی ڕۆژانە ‹ئەریٚ ئەی کۆنەکاری پیری مەکرۆ!/ وەزیفەم جیرەنانیٚ بوو بە بیٚ دۆ! «شەهید»› ١. وظیفه ٢. جیره‌ی روزانه

**وەزین / wezîn/**: چاوگ. وەزان: ١. شنین؛ هاتنی با ٢. بەرەو خوار هاتن ‹خێڵ نەوەزی لەتەچن وەزی!› ٣. بەزین؛ ژێر کەوتن لە شەڕ و ملەدا ٤. غاردان؛ ڕاکردن ٥. کەوتنی تاو ١. وزیدن ٢. پایین آمدن ٣. شکست خوردن ٤. تاختن؛ دویدن ٥. برآمدن آفتاب

**وەزێت / wezêt/**: ناو. چلۆنایەتی حاڵ و هەواڵ وضعیت

**وەژار**[1] **/ wejar/**: ناو. وجز؛ وجێز؛ وجێس؛ بژار وجین

**• وەژار**[2]: پاشەوشە. ڕێک‌کەر ‹گوڵوەژار› ـ پیرا

**وەژارتن / wejartin/**: چاوگ. تێپەڕ. //وەژارتت؛ دەوەژێری؛ بوەژێرە// وەژاردن؛ ناڕێک و ناپەسند لە ناو ڕێک و باش دەراویتن پیراستن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەوەژارتن

**وەژاردن / wejardin/**: ☜ **وەژارتن**

**وەژارە / wejare/**: ناو. ١. پەژارە؛ خەم؛ کوڵ ٢. بیر و خەیاڵ ١. غم؛ اندوه ٢. خیالات

**وەژنکار / wejinkar/**: ☜ **وەژەنکار**

**وەژە / weje/**: ☜ **وەژەب**

**وەژەب / wejeb/**: ناو. وەژە؛ ویژە؛ بست؛ بنگووس؛ بۆست وجب

**وەژەگ / wejeg/**: ناو. پەخشان؛ وێژامە؛ نووسراوەی ئاسایی بەبیٚ تایبەتمەندی شیعر نثر

**وەژەن / wejen/**: ناو. تاوان؛ گوناح گناه

**وەژەنکار / wejenkar/**: ئاوەڵناو. وەژنکار؛ تاوانبار؛ گوناحکار گُناهکار

**وەژیای / wejyay/**: چاوگ. کەنران؛ داکەنران؛ داکەنیان درآورده شدن

**وەژینگ / wejîng/**: ناو. ویژینگ؛ چۆرت؛ سەرخەو چُرت

▣ **وەژینگ دان**: چۆرت دان؛ سەرخەو شکاندن چُرت زدن

**وەس**[1] **/ wes/**: ئاوەڵناو. بەس؛ بەسندە کافی

**وەس**[2]: ئاوەڵکار. بەس: ١. چیتر نا ٢. *[پلار]* کەم ‹زەمامت با وەس بە دەس هەوەس بۆ/ وەس فامت نە فکر کەردەی عەبەس بۆ «داخی»› ١. کافی ٢. کَم

**• وەس**[3]: پاشەوشە. ـ بەست ‹دەروەس› ـ بست

**وەسا**[1] **/ wesa/**: ☜ **وەستا**

**وەسا**[2]: ☜ **وەسان**[2]

**وەسار / wesar/**: ناو. ١. ☜ **واسار** ٢. ☜ **هەوسار**

**وەساری / wesarî/**: ئاوەڵناو. بەهاری؛ تایبەتی بەهار (ڕووەک) بهاری (سبزه)

**وەسان**[1] **/ wesan/**: چاوگ. ١. وەستان؛ لە کار کەوتن ٢. ماندوو بوون ١. از کار افتادن ٢. خسته شدن

**وەسان**[2]: ئاوەڵکار. وسا؛ وسان؛ وەسا؛ ئاوەها؛ ئاوها؛ ئاوا ‹وەسان دبێژیٚ زەردەشتیٚ ڕێزان/ ئەهریمان دشکیٚ، هورموز تیٚ مەیدان «جگەرخوێن»› این‌طور

**وەسایی / wesayî/**: ☜ **وەستایی**[1]

**وەسپ / wesp/**: ☜ **وەسف**

**وەستا / westa/**: ناو. وسا؛ وستا؛ وەسا؛ ئوسا؛ ئووسا؛ ئوستا؛ ئوستاد؛ هۆستا؛ هۆسا: ١. مامۆستا ٢. چێکەر؛ وەدیهێنەر ‹چاوم هەڵبڕی ئاسمانم دی/ وتم: بیٚ وەستا نەهاتۆتە دی «پیرەمێرد»› ١. اُستاد ٢. سازنده

**وەستاخانە / westaxałe/**: ناو. ئاسنگەر آهنگر

**وەستاکار / westakar/**: ناو. هۆستاکار؛ پیشەساز استادکار

**وەستامستەفا / westamistefa/**: ☜ **نەرمەبەدۆ**

**وەستان / westan/**: چاوگ. تینەپەڕ. //وەستای؛ دەوەستێی؛ بوەستیٚ// وستان؛ وەستین؛ وێسان؛

وێستان؛ وێسیان: ١. به پێوه بوون؛ لـه سـەر پـاوه بوون ‹دوو سەعاته لێره وەستاوم› ٢. له کار و جووڵه کەوتن ‹له ناڵەی هـەور و لافـاوه کـه ئیمـڕۆ ناگـەڕێ جووتم/ له بێ بارانییه وەستاوه ئاشـم، گرمـەیی نایـێ «عـورفی»› ٣. وەسـتانەوه؛ باشـاری یـان پێکۆڵـی کردن ‹لـه بەرامبـەر دوژمنـەوه چـاک وەسـتاون› ٤. سەبر کردن؛ ماتڵ بـوون ‹نـەختێ بوەسـته دێم› ⧉ ١تا٤. ایستادن

■ ئاوەڵـناوی بـەرکاری: وەسـتاو/ چـاوگی نـەرێنی: نەوەستان

**وەستاندن / westandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //وەستاندت؛ دەوەسـتێنی؛ بوەسـتێنه// وێسـاندن؛ وێسـانن: ١. ڕاگرتن؛ له بزووتن خسـتن ‹خـودا! پێشـەنگی ئـەو خێڵـه، سـەعاتێ/ بوەسـتێنه؛ هـەتا ئـاوات دەگاتـێ «ئـاوات»› ٢. مانـدوو/ شـەکەت کـردن ٣. ئەسـتاندنەوه؛ سـاننەوه ‹دەبـێ ئەوقـەرزەی لـێ وەستێنم› ⧉ ١. متوقف کردن ٢. خسته کردن ٣. پس گرفتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەوەستاندن

**وەستاندنەوه / westand(i)newe/**: چـاوگ. ڤەڤەستاندن؛ له کار وەستاندن ⧉ از کار بازداشتن

**وەستانەوه / westanewe/**: چـاوگ. تێنەپـەڕ. //وەستایەوه؛ دەوەستێیەوه؛ بوەستێوه// وێستانەوه؛ وێسانەوه؛ وێسیانەوه: ١. ڕاسانەوه؛ هەڵمەت بـردن ‹لێی وەستامەوه مستێکم تـێ سرەواند› ٢. وشـک بوون (باران و دڵۆپه) ٣. دووباره وەستان ⧉ ١. حمله کردن ٢. بند آمدن (باران و چکه) ٣. دوباره متوقف شدن

■ ئاوەڵناوی بـەرکاری: وەسـتاوەوه/ چاوگی نـەرێنی: نەوەستانەوه

**وەستاو / westaw/**: ئاوەڵـناو. وەسـتای؛ وێسـاگ؛ وێسیاگ؛ وێساو: ١. لـه جووڵـەکەوتوو ٢. مانـدوو؛ مانگ ‹کابرایەکی لـه کـار وەسـتاو› ⧉ ١. متوقـف ٢. خسته

**وەستاوه / westawe/**: ئاوەڵناو. ڤەڤەستای؛ وێستاو ⧉ بازایستاده

**وەستای / westay/**: ☜ وەستاو

**وەستایی[1] / westayî/**: نـاو. وەسـایی؛ هۆسـتایی؛ ئوسایی؛ زانایی له کار ‹ئەیگرێتەوه خراپه، ئەوان دێنه کایەوه/ چوار نانه ئەو کەسەی که به وەستایی مایـەوه «پیرەمێرد»› ⧉ استادی

**وەستایی[2]**: ئاوەڵکار. به ڕاوەستاوی؛ به پێوه ⧉ سر پا

**وەستەگ / westeg/**: ئاوەڵـناو. چـەمووش؛ خـراپ ڕاهاتوو (ئەسپ) ⧉ چموش (اسب)

**وەستەی / westey/**: چاوگ. هەڵـبەزین؛ هەڵـچوون ⧉ بالا رفتن؛ صعود کردن

**وەستیان / west(i)yan/**: چـاوگ. مانـدوو بـوون؛ شەکەت بوون ⧉ خسته شدن

**وەستیتی / westîtî/**: ناو. کـاری وێسـتان بـه پێـوه؛ هەڵوێستان ⧉ عمل سر پا ایستادن

**وەستین / westîn/**: ☜ وەستان

**وەسسەلام / wesselam/**: سارسته. تەواو؛ چـیتر نـه؛ چیتر نا؛ هەر ئەمه و بەس؛ ئاوێک بێنه و دەسـتان بشۆ ⧉ والسلام

**وەسف / wesf/**: نـاو. وەسـپ؛ پەسـن؛ تـاریف ‹چ حاجـەت نەرگسـی مەسـتت بکـەم وەسـفی بـه مەخمووری/ که چاوێ سورمەکێشراوی خودایی بێ، له کل چ بکا؟ «مەحوی»› ⧉ وصف

**وەسفین / wesfîn/**: چاوگ. پەسن دان؛ تاریف کردن ⧉ مدح کردن

**وەسڵ / wes(i)ł/**: ناو. دۆخی پێک گەیشتن ‹من که مـەحرووم بـووم لـه وەسڵـت تـازه ژیـنم بـۆ چییـه؟/ حورمەت و جـاه و جـەلال و ڕۆح و دیـنم بـۆ چییـه؟ «بێکەس»› ⧉ وصل

**وەسمه / wesme/**: ☜ وسمه

**وەسنی / wesnî/**: ☜ وسنی

**وەسواس[1] / weswas/**: نـاو. واسـواس؛ وسـواس؛

وەرواس: ١. [دەروونناسی] بیر و هەستێکی تێکەڵ بە شک و دڕدۆنگی بەتایبەت لەمەڕ پاکی و ناپاکی و دڵنیا نەبوون لە سەر خاوێنی هەموو شتێک ٢. [مەجاز] وردی، وردبینی و شوێنگیری زۆر و لەڕادەبەدەر ٣. [کینایە] شک؛ دوودڵی؛ دڕدۆنگی ≡ ١. وسواس ٢. دقت ٣. شک

**وەسواس**[٢]: ئاوەڵناو. واسواس؛ وسواس؛ وەرواس؛ دڕدۆنگ؛ ڕاـڕا؛ وازـواز ≡ وسواس

**وەسواسە** / weswase/: ناو. پەشێوی؛ دڵخورتی؛ نیگەرانی ‹فیکر و خەیاڵان وەسواسەی وەفات/ دایم نە دڵەن نە ڕووی سەربیسات «مەولەوی»› ≡ نگرانی

**وەسواسی** / weswasî/: ئاوەڵناو. [دەروونناسی] وسواسی؛ ڕا ـڕایی؛ واز ـوازی؛ هەووک؛ بەبێ توانستی بڕیار دان و دڵنیا بوون ‹نەخۆشی وەسواسی› ≡ وسواسی

**وەسوەسە** / weswese/: ناو. فلووف؛ بیر یان هەستێک کە لە پەستا مرۆ بۆ کردنی کارێک هان دەدا ‹پێ‌هەڵخرێنە وەسوەسەی ئیبلیس/ ڕیشی تەماعکار بە قنگی موفلیس! «پیرەمێرد»› ≡ وسوسه

**وەسوڕان** / wesûřan/: چاوگ. پێچ دانەوە؛ گەڕانەوە ≡ بازگشتن

**وەسە**[١] / wese/: ناو. خواستە؛ داوا ≡ خواسته

**وەسە**[٢]: ئامراز. وەک؛ چەشنی؛ مەنید؛ عەین ‹وەسە ئاسیاو ئاوکەفتگ› ≡ مثل

**وەسەتی** / wesetî/: ناو. ساغی؛ ساقی؛ سلامەت ≡ سلامت

**وەسەر** / weser/: ئاوەڵکار. بەسەر ‹تۆ بفەرموو، مەن وەسەر تێمە خزمەتت› ≡ بەسر

**وەسەفیاییش** / wesefyayîş/: چاوگ. نۆرە گرتن؛ نۆبە گرتن ≡ نوبت گرفتن

**وەسەم** / wesem/: ناو. ئامرازی ڕەنگ و ڕوو گۆڕین ≡ وسایل گریم

**وەسی** / wesî/: ناو. ١. ئامۆژگاری؛ نسحەت ٢. ☜ وەسیەت ≡ ١. نصیحت ٢. ☜ وەسیەت

**وەسین** / wesîn/: چاوگ. ١. وچان دان؛ وێستان ٢. ڕامان ≡ ١. توقف کردن ٢. تأمُّل کردن

**وەسیەت** / wes(i)yet/: ناو. وەسی؛ وەسێت؛ قەوینتی؛ ڕاسپێری ‹وەسیەتی من بێ جوانت خۆش نەوێ/ کێ دیویە وەفا لای جوان دەسکەوێ؟ «پیرەمێرد»› ≡ وصیت

⊡ **وەسیەت کردن**: ١. ڕاسپاردن بە دیتران بۆ دوای مەرگ ٢. ئامۆژگاری کردن ٣. [مەجاز] لە حاڵی نزیک لە مردندا بوون ≡ ١. وصیت کردن ٢. نصیحت کردن ٣. در حال احتضار بودن

**وەسیەت نوسین**: نووسینی ڕاسپاردەکانی خۆ بۆ دوای مەرگ ≡ وصیت نوشتن

**وەسیەتنامە** / wes(i)yetname/: ناو. ڕاسپێری و قەوینتی بە نووسراوی ≡ وصیتنامه

**وەسێ** / wesê/: ئاوەڵکار. زۆر؛ گەلێ ≡ بسی؛ بسیار

**وەسێت** / wesêt/: ☜ وەسیەت

**ـ وەسێن** / -wesên/: پاشەوشە. ئەستێنەوە ‹تۆڵەوەسێن› ≡ بازستاننده

**وەسێنایش** / wesênayîş/: چاوگ. وەڵام ناردن؛ ئاگادار کردن ≡ پیغام فرستادن

**وەش**[١] / weş/: ناو. بەش: ١. بەش؛ پاژ ٢. ئامال ≡ ١. سهم؛ قسمت ٢. فام

**وەش**[٢]: ئاوەڵناو. خوەش؛ خۆش: ١. دڵپەسند ‹سەدای ساز عەشق، وەشەن سەیدی وەش/ وەش نیەن تۆ بی جە وەشی بێ بەش «سەیدی»› ٢. چاک؛ باش ‹سەدای ساز عەشق، وەشەن سەیدی وەش/ وەش نییەن تۆ بی جە وەشی بێ بەش «سەیدی»› ≡ ١. خوش ٢. خوب

⊡ **وەش کەردش**: ١. زیندوو کردنەوە ٢. چاکردنەوە لە نەخۆشی ٣. خۆش ڕابواردن ٤. گەپ و گاڵتە گوتن ٥. زیاد لە ڕادە پەسن دان ٦. هەڵواسان ٧. لێدان ≡ ١. زنده کردن ٢. شفا دادن ٣. خوش

گذشتن ۴. مزاح کردن ۵. بیش از حد تعریف کردن ۶. آویزان شدن ۷. زدن

**وەش**[٢]: ئاوەڵکار. چاک؛ خۆش 🇮🇷 خوش

**وەش ـ**[٤]: پێشوشە. خۆش ـ ‹وەشەومر؛ وەشحاڵ› 🇮🇷 خوش ـ

**ـ وەش**[٥]: پاشەوشە. ـ خۆش ‹سەرومش؛ بالاوەش؛ خاڵوەش› 🇮🇷 ـ خوش

**وەش**[٦]: دەنگەناو. هۆش؛ وەوش؛ وۆش؛ وتەی کەر وێساندن 🇮🇷 هُش؛ چُش

**وەش**[٧]: دەنگ. هۆش؛ وەوش؛ وۆش؛ وتەی فەرمان بە کەر دان واتا وەستە یان هۆشت بێ 🇮🇷 هُش

**وەشارتن** / weşartin/: ☜ **وەشاردن**

**وەشارتو** / weşartû/: ئاوەڵناو. وەشارتی؛ داپۆشراو 🇮🇷 پوشیده

**وەشارتی** / weşartî/: ☜ **وەشارتو**

**وەشاردن** / weşardin/: چاوگ. وەشارتن؛ شاردنەوە ‹دەنا بێشک لە بەر دەسرێژی لاوان/ دەبێ وەک بارەکەو هەر خۆت وەشێری «هێمن»› 🇮🇷 پنهان کردن

**وەشارنایش** / weşarnayîş/: چاوگ. داڕووتاندن (بۆ لکەدار و کەللەپاچە) 🇮🇷 سطح چیزی را کاملاً پاک کردن

**وەشـان** / weşan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //وەشای؛ دەوەشێی؛ بوەشێ// ١. بلاو بوونەوە ٢. ڕاتلەکان ٣. وشین؛ دلۆپە چک بوون؛ وەستانەوە و وشک بوون (باران و دلۆپە) 🇮🇷 ١. پخش شدن ٢. تکان خوردن ٣. متوقف شدن (باران و چکّه)

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: وەشاو/ چاوگی نەرێنی: نەوەشان

**وەشانایش** / weşanayîş/: چاوگ. ١. (نووسراوە بە ئاو) کوژاندنەوە ٢. هەڵواسین ٣. پڕ پێدا کردن و ڕفاندن 🇮🇷 ١. (نوشته را با آب) پاک کردن ٢. آویزان کردن ٣. ربودن

**وەشاندن** / weşandin/: چاوگ. تێپەڕ. //وەشاندت؛ دەوەشێنی؛ بوەشێنە// وەشانن: ١. بلاو کردنەوە ‹تۆم وەشاندن› ٢. ڕاتلەکاندن ‹بە عەشقی شیرین تەشوێی ئەوەشاند/ بە زۆری بازوو کێوی ئەڕووخاند «پیرەمێرد»› ٣. لێدان ‹شێتی وا هەیە شەق ئەوەشێنێ/ عاشقە و شێوەی شێتی ئەنوێنێ «پیرەمێرد»› ٤. وەستاندنەوە (دلۆپە) 🇮🇷 ١. افشاندن ٢. تکان دادن ٣. (ضربه) زدن ۴. متوقف کردن (چکّه)

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەوەشاندن

**وەشاندنەوە** / weşand(i)newe/: چاوگ. ڕووشکنای؛ ڕووشاندن 🇮🇷 توزیع کردن

**وەشانن** / weşanin/: ☜ **وەشاندن**

**وەشانەوە** / weşanewe/: چاوگ. تێنەپەڕ. //وەشایەوە؛ دەوەشێیەوە؛ بوەشێوە// وەشیانەوە: ١. شیان؛ ڕێک و ڕەوا بوون ‹ئەم کارە لە تۆ ناوەشێتەوە؛ ئەم جلە لە تۆ دەوەشێتەوە› ٢. بەشینەوە؛ دابەش کردن 🇮🇷 ١. شایستن ٢. پخش کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: وەشاوەوە/ چاوگی نەرێنی: نەوەشانەوە

**وەشاو**[١] / weşaw/: ناو. خۆشاو؛ خوەشاو؛ ئاوی میوەی خووساو 🇮🇷 خوشاب

**وەشاو**[٢]: ئاوەڵناو. پژیاگ؛ ئاوێژراوی بلاوکراو 🇮🇷 افشانده شده

**وەشاییش** / weşayîş/: چاوگ. ڕمان؛ ڕووخان؛ تێک تەپین 🇮🇷 آوار شدن

**وەشبەخت** / weşbext/: ئاوەڵناو. بەختەوەر؛ بەختیار 🇮🇷 خوشبخت

**وەشبەش** / weşbeş/: ناو. چاکوخۆشی؛ چاق سلامەتی 🇮🇷 خوش و بش

**وەشت** / weşt/: ناو. ١. بای باشووری ڕۆژهەلاتی ‹ڕابوردوو بای وەشتە و لە ڕۆحتا هەڵئەکات «شێرکۆ»› ٢. نەرمە بارانی بە نەرمەباوە ‹عەجەب بادەن، عەجەب هەورەن، عەجەب وەشت/ چە خاس ــ خاس نم مەدۆ سارا و دەر و دەشت! «سەیدی»› ٣.

واران؛ باران ▣ ١. باد جنوب شرقی ٢. نم نم باران با نسیم ٣. باران

**وەشتار** / weştar/: ناو. کارداک؛ گەشتیار ▣ گردشگر

**وەشتر** / weştir/: ☜ **وشتر**

**وەشتووار** / weşt û war/: ناو. باران و ڕەهێڵە ▣ باران و رگبار

**وەشتە** / weşte/: ناو. جوانی دڵکێش کە مرۆ ئارەزووی دەکا ▣ زیبای دلربا

**وەشتەن** / weşten/: ناو. سەما و ڕەخس (دەروێشانە) ▣ رقص و سماع

**وەشتەی** / weştey/: چاوگ. بارین ▣ باریدن

**وەشتی** / weştî/: ناو. ١. ئیشتیا؛ واژۆ؛ وازی خواردن ٢. تاسە؛ تامەزرۆیی ▣ ١. اشتها ٢. اشتیاق

**وەشدوخت** / weşduxt/: ئاوەڵناو. خۆشپۆش؛ تەڕپۆش ▣ شیک‌پوش

**وەشران** / weşran/: ☜ **وەشیای**

**وەشراو** / weşraw/: ☜ **وەشیاو ـ١**

**وەششە** / weşşe/: دەنگ. وۆش؛ وتەی وەستاندن و گەڕاندنەوەی کەر ▣ هُش

**وەشڵە** / weşłe/: ئاوەڵناو. جوانکەڵە ▣ زیبا

**وەشڵەی** / weşłey/: نزا. وەشڵەیم: ١. خۆزیا؛ خۆزگە ٢. خۆزگەم بە؛ خۆشی لە ▣ ١. کاشکی ٢. خوشا

**وەشڵەیم** / weşłeym/: ☜ **وەشڵەی**

**وەشمەک** / weşmek/: ئاوەڵناو. خۆشخوێ؛ خوەش‌خوێ ▣ خوش‌نمک

**وەشنای** / weşnay/: ☜ **وشاندن**

**وەشووار** / weş û war/: ئاوەڵناو. زۆر ساغ و بەدەماخ ▣ سالم؛ سرحال

**وەشوین** / weşwîn/: ئاوەڵناو. خۆشبین ▣ خوشبین

**وەشۆردن** / weşordin/: چاوگ. شۆردن؛ شتن ‹وە کار خەم دەستەلات و هێزی زۆرم/ بە خوێنێ ئەو پەلە و نەنگە وەشۆرم «هێمن»› ▣ شستن و پاک کردن

**وەشە** / weşe/: ناو. خۆشە: ١. خۆشی؛ خوەشی ٢. ناوکی شیرینی میوە ▣ ١. خوشی ٢. مغز هستەی شیرین میوە

**وەشەت** / weşet/: ناو. شیوەن؛ شەپۆڕ؛ شین ▣ شیون

**وەشەک**[1] / weşek/: ناو. ١. ☜ **وشەک** ٢. ڕەوتی ڕاژان؛ لەرزینی توند و بەهێز ٣. دڵخۆشی؛ دڵڕوونی؛ گەشی ٤. جێ تووتن ▣ ١. ☜ **وشەک** ٢. لرزەی شدید ٣. دلخوشی ۴. جای توتون

**وەشەک**[2]: ئاوەڵناو. ١. بەرچاو؛ جوان؛ خوشیک ٢. جوانی بەناز ▣ ١. خوش‌تیپ ٢. طناز

**وەشەگ** / weşeg/: ☜ **وشەک**

**وەشەن** / weşen/: ناو. شڵێوە؛ بڕێش؛ دوودانگ؛ بەفر و باران پێکەوە ▣ برف و باران با هم

**وەشەویسی** / weşewîsî/: ناو. خۆشەویستی؛ دڵۆڤانی ▣ مَحبّت

**وەشەی**[1] / weşey/: ناو. ١. وەشی؛ خۆشی ٢. جوان‌چاکی ٣. ☜ **وشو** ▣ ١. خوشی ٢. خوش‌تیپی ٣. ☜ **وشو**

**وەشەی**[2]: ئاوەڵناو. تامخۆش ▣ خوشمزه

**وەشی** / weşî/: ناو. ١. خوەشی؛ خۆشی؛ دڵشادی؛ کەیف‌سازی ‹دین جە دەستم سەند ئیمان ستانا/ وەشی ئەی دنیا هیچ پێم نەمانا «بێسارانی»› ٢. ☜ **وشو** ▣ ١. خوشی و شادی ٢. ☜ **وشو**

**وەشیار** / weşyar/: ناو. بڵاوکەرەوە؛ کەسێ پەرژ و بڵاو دەکاتەوە ▣ پخش‌کننده؛ توزیع‌کننده

**وەشیاگ** / weşyag/: ☜ **وەشیاو ـ١**

**وەشیان** / weşyan/: چاوگ. ١. تێ‌شیشان تێ‌شیشیان؛ بە پەلەپەل خەریکی کارێک بوون (زۆرتر بە پلار) ٢. بڵاو کرانەوە بەزەویدا ▣ ١. بە جان چیزی افتادن ٢. پاشیده شدن

**وەشیانەوە** / weşyanewe/: ☜ **وەشانەوە**

**وەشیاو** / weşyaw/: ئاوەڵناو. ١. وەشراو؛ وشیاو؛ وەشیاگ ٢. بە زەویدا پرژوبلاو کراو ▣ ١. پاشیده

(تخم) ٢. پخش و پراکنده شده

**وەشیای** / weşyay/: چاوگ. وەشران 🇮🇷 پاشیدن

**وەشیر** / weşîr/: ئاوەڵناو. بەشیر؛ زۆر شیردەر 🇮🇷 بسیار شیرده

**وەشین** / weşîn/: چاوگ. ١. بڵاو کردنەوە ٢. داوەرین 🇮🇷 ١. پخش کردن ٢. فروریختن

**وەشینەک** / weşînek/: ناو. هۆی بڵاوبوونەوە؛ دەزگای بڵاوکرنەوە 🇮🇷 وسایل ارتباط جمعی

ـــ **وەشێر** / -weşêr/: پاشەوشە. ١. داپۆشەر ‹مردوووەشێر› ٢. ـ شارەوە ‹پارەوەشێر› 🇮🇷 ١. پوشاننده ٢. پنهان‌کننده

**وەشێران** / weşêran/: چاوگ. ١. نێژران؛ ژێر خاک کران ٢. شاردرانەوە؛ شاریانەوە 🇮🇷 ١. زیر خاک شدن ٢. پنهان شدن

**وەشێراو** / weşêraw/: ئاوەڵناو. ١. نێژراو؛ ژێر خاک‌کراو ٢. شاردراوە؛ ڤەشارتی 🇮🇷 ١. زیر خاک شده ٢. پنهان شده

**وەشێردران** / weşêrd(i)ran/: چاوگ. شاردرانەوە؛ شارانەوە؛ شاریانەوە 🇮🇷 پنهان شدن

ـــ **وەشێن** / -weşên/: پاشەوشە. ١. بڵاوکەرەوە ‹تۆوەوەشێن؛ بلوەشێن› ٢. هاوێژەر؛ خەر ‹شیروەشێن؛ دەستوەشێن› 🇮🇷 ١. ـ افشان ٢. ـ انداز؛ ـ زن

**وەشێنران** / weşênran/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //وەشێنرای؛ دەوەشێنرێی؛ بوەشێنرێ// شانیای؛ شەنیای: ١. پاشران؛ پەخش کرانەوە ٢. لێدران؛ هاوێژران 🇮🇷 ١. پاشیده شدن ٢. افکنده شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: وەشێنراو/ چاوگی نەرێنی: نەوەشێنران

**وەعد** / we'd/: ☜ **وادە**

**وەعدە** / we'de/: ☜ **وادە**

**وەعز** / we'z/: ناو. مۆچیاری؛ نەسیحەت 🇮🇷 وعظ

**وەعزدادەر** / we'zdader/: ناو. پەندێر؛ ئامۆژگاری‌کەر 🇮🇷 اندرزگو

**وەفا** / wefa/: ناو. ئەمەگ؛ بەینەت؛ ڕەوتی پەیمان و بەڵێن بردنە سەر ‹نیمە ئاواڵێ لە گۆشەی بێکەسیدا، خەم نەبێ/ چاکە ئەو لێرەش وەفای هەر ماوە، سایەی کەم نەبێ «هێمن»› 🇮🇷 وفا

**وەفات** / wefat/: ناو. کۆچی دوایی؛ دواکۆچ؛ مەرگ 🇮🇷 وفات

**وەفادار** / wefadar/: ئاوەڵناو. وەفاکار؛ بەئەمەگ؛ چاکە لە چاو؛ بەینەتدار ‹ژنی پێشووم هەر زۆر باش و ژنی دواییم لە باشیش باشتر و لە وەفاش وەفادارتر بووە و ئێستاش لە پیریمدا مایەی هەموو دڵخۆشی ژیانمە «هەژار، چێشتی مجێور»›. هەروەها: **وەفاداری** 🇮🇷 باوفا؛ وفادار

**وەفاکار** / wefakar/: ☜ **وەفادار**

**وەفاڵ** / wefał/: ئاوەڵناو. بەفاڵ؛ تایبەتمەندی ماکەر و ماینی نێرخواز و تامەزرۆی جووت بوون 🇮🇷 نَرخواه (ستور ماده)

**وەفد** / wefd/: ناو. وەڤد؛ کۆڕی نێردراو بۆ شوێنێک ‹کە وەفدێ دەچێتە شوێنێ/ بۆ سەر گۆڕی سەربازی ون/ تاجەگوڵینەیەک دێنێ «پەشێو»› 🇮🇷 هیأت

**وەفر** / wefr/: ☜ **بەفر**

**وەفرنایش**[٢]: ئاوەڵناو. وەفەرنایش؛ هەڵمساو؛ پفدراو 🇮🇷 بادکرده

**وەفرناییش**[١] / wefrnayîş/: چاوگ. وەفەرناییش؛ بە فوو هەڵمساندن 🇮🇷 باد در چیزی کردن و پُف دادن

**وەفرە** / wefre/: ناو. کەتیرەی سپی 🇮🇷 کتیرای سفید

**وەفە** / wefe/: ناو. باخە؛ جۆرێک نەخۆشی یەکسمە، شەلی دەکا 🇮🇷 از بیماری‌های ستور

**وەفەرناییش** / wefernayîş/: ☜ **وەفرناییش**

**وەڤد** / wevd/: ☜ **وەفد**

**وەڤەر** / wever/: ئاوەڵکار. هۆوەندە؛ ئەو شوێنە دوورە 🇮🇷 آن دوردست

**وەق**[١] / weq/: ناو. بۆق؛ بەق؛ قڕواق 🇮🇷 غوک؛ قورباغه

**وەق**[٢]: دەنگەناو. دەنگی مراوی؛ دەنگی بەق ☰ صدای مُرغابی و قورباغه

**وەقا** / weqa/: ناو. وەققا؛ وەقە؛ وەقی؛ حۆقە؛ کێشانەیەکە بەرانبەر بە ١١٨٣ گرەم ☰ وزنی معادل ١١٨٣ گرم

**وەقت** / weqt/: ☜ وەخت ـ١

**وەقتا** / weqta/: ناوەلکار. وەقتوو؛ وەختێکی؛ لە کاتێکدا ☰ زمانی

**وەقتو** / weqtû/: ☜ وەقتا

**وەقرە** / weqre/: ناو. ئۆقرە؛ ئارام ☰ آرام

**وەقف** / weqf/: ناو. ١. بڕیارێ کە دان و ستان و دەستێوەردانی ماڵ یا ملکێ قەدەغە دەکا تا داهاتەکەی لە شتێکی تایبەتدا خەرج بکرێت ٢. ملک یان ماڵێکی وا ‹ئەم دووکانە وەقفی مزگەوتن› ☰ ١و٢. وقف

**وەققا** / weqqa/: ☜ وەقا

**وەقوەق** / weqweq/: دەنگ. دەنگی بۆق و مراوی ☰ واق ـ واق

**وەقە** / weqe/: ☜ وەقا

**وەقی** / weqî/: ☜ وەقا

**وەک** / wek/: ئامراز. وەکا؛ وەکۆ؛ وەکوو؛ وەکە؛ وەکی؛ وەکێ؛ وەگ: ١. چون؛ لە جۆر؛ لە تەرح؛ ئاسایی ‹هاوینمان بۆ هات وەک کلپەی تەنوور/ تەپەدووکەڵی خستە شارەزوور «پیرەمێرد»› ٢. بە جۆرێ کە ‹وەک دەڵێی ...؛ وەک زانیویە ...› ☰ ١. چون؛ مانندِ ٢. چنانکه

**وەکا** / weka/: ☜ وەک

**وەکات** / wekat/: ناوەلناو. ڕەپ و ڕاست؛ بێڕووبینی ☰ رُک و صریح

⊡ **وەکات کردن**: درکاندنی ڕاستی ☰ بروز دادن حقیقت

**وەکار**[١] / wekar/: ناو. کاوێژ؛ قاویش ☰ نشخوار

**وەکار**[٢]: ناوەلناو. ١. ئازا؛ بوێر ٢. کارا؛ چالاک؛ زۆر کارکەر ☰ ١. شُجاع ٢. کاری

**وەکاریان** / wekaryan/: چاوگ. کاوێژ کردن ☰ نشخوار کردن

**وەکاز** / wekaz/: ناو. عاسا؛ دار عاسا؛ گۆچان ☰ عصای دست

**وەکاشە** / wekaşe/: ناو. *[باوەڕی کۆن]* دۆعایەکە بۆ چارەی شێتانیان دەنووسی ☰ دعای شفای دیوانگان

**وەکچتێ** / wekç(i)tê/: ☜ وەك شتێ

**وەکری** / wek(i)rî/: ناوەلناو. ئاوەلا؛ بەربەتاک ☰ بازگذاشته شده

**وەکشان** / wek(i)şan/: ☜ وەکشانەوە

**وەکشانەوە** / wek(i)şanewe/: چاوگ. وەکشان؛ وەکشین؛ کشانەوە ☰ برگشتن

**وەکشتێ** / wekş(i)tê/: ناوەلکار. گوایە؛ گوایا؛ چما؛ وەکچتێ ☰ گویا

**وەکشین** / wek(i)şîn/: ☜ وەکشانەوە

**وەکۆ**[١] / weko/: ↓

⊡ **وەکۆ بوون**: کۆوە بوون؛ کۆ بوونەوە ☰ جمع شدن

**وەکۆ کردن**: کۆ کردنەوە ‹کچی میران دەبێ لیران وەخۆ خەن/ کچی گاوان دەبێ پووشکان وەکۆ کەن «هێمن»› ☰ جمع کردن

**وەکۆ**[٢]: ناوەلکار. هەرگا؛ هەرکات ☰ هرگاه

**وەکۆک** / wekok/: ئامراز. وەک؛ وەکی؛ وەکوو؛ مینا؛ هاوتا لە ڕەنگ و تەرحا ☰ مانندِ

**وەکوو** / wekû/: ☜ وەك

**وەکە** / weke/: ☜ وەك

**وەکەتی** / weketî/: ئامراز. وەک؛ وەکوو؛ وەکی ☰ مانند؛ مثل

**وەکەردش** / wekerdiş/: چاوگ. ١. قەلاشتن؛ تلیشاندن ٢. کردنەوەی گرێ و داخراو ٣. دەرکێشان؛ کێشانە دەر ٤. گلۆلە/ تۆپەڵ کردن ٥. هەلکردن/ پێکردنی ئاگر ٦. شەکاندنەوە؛

ڕاوەشاندن ٧. پاک کردن (کەللەپاچە) ☰ ١. شکافتن ٢. باز کردن ٣. بیرون کشیدن ۴. گلوله‌ای کردن ۵. برافروختن آتش ۶. تکان دادن ٧. پاک کردن (کله‌پاچه)

**وەکەردەنە** / wekerdene/: چاوگ. ١. لێک جیا کردنەوە ٢. هەڵکردن؛ داگیرساندن ٣. کێلان ٤. کردنەوە (درگا) ☰ ١. جدا کردن از هم ٢. افروختن ٣. کاشتن ۴. باز کردن (در)

**وەکهەڤی** / wekhevî/: ناو. یەکسانی؛ بەرامبەری ‹ئەم شەر ناخوازن/ دڤێن وەکهەڤی/ ئەم پاشڤە ناچن/ دژمن درەڤی «جگەرخوین»› ☰ برابری؛ یکسانی

**وەکی**[1] / wekî/: ئاوەڵکار. هەرکات ☰ هرگاه

**وەکی**[2]: ئامراز. ١. ☜ **وەك** ٢. ئەگەر؛ هەگەر ☰ ١. ☜ **وەك** ٢. اگر

**وەکیل** / wekîl/: ناو. وەکیل؛ بریکار: ١. دەمڕاس؛ کەسێ کە لە لایەن کەسێکی‌ترەوە بۆ ئەنجامدانی کارێک ڕادەسپێردرێ ‹ئازادم کردە وەکیلی خۆم، ماڵەکەی سەردەشت بفرۆشێ› ٢. نوێنەر؛ نەوەنگە؛ بەندەر؛ نیوەر؛ نۆنەر ‹وەکیلی یەکەمی ئیلام لە پارلەمان بوو› ٣. ناڤبێژ؛ پارێزەر؛ مافپارێز ‹وەکیلی بەرتاوانەکە، پەروەندەکەی نەخوێندبۆوە!› ☰ ١. وکیل ٢. نماینده ٣. وکیل

**وەکیلەڵڵا** / wekîlełła/: نزا. خوامابەین؛ خوا وەکیلە ☰ خداوکیل

**وەکیلەی** / wekîley/: ناو. بریکاری؛ وکێلی ☰ وکالت

**وەکیەک** / wekyek/: ئاوەڵناو. هاوشێوە؛ هاوچەشن ☰ شبیه

**وەکیەکی** / wekyekî/: ناو. بەرانبەری؛ هامتایی ☰ مُشابهت

**وەکێ** / wekê/: ☜ **وەك**

**وەکێڵ** / wekêł/: ☜ **وەکیل**

**وەگ**[1] / weg/: ناو. چاخ؛ هەڕەت؛ جەنگە؛ ناف ☰ موسم

**وەگ**[2]: ☜ **وەك**

**وەگر**[1] / wegir/: ئاوەڵناو. ١. لە خەرج گێڕەوە ‹لە ماڵدا هەموو دەس‌بڵاون هەر من وەگرم› ٢. دامەزرێنەر و بەرپاکەری چادر و جیغ و پەردە ٣. ئاهۆ؛ درم؛ گیرۆ ☰ ١. صرفەجو ٢. برپاکنندەی خیمه و پرده ٣. واگیردار

**- وەگر**[2]: پاشەوشە. گرەوە؛ قۆزەرەوە ‹خشت‌وەگر؛ تۆپ‌وەگر› ☰ - گیر

**وەگرگریایەنە** / wegirgiryayene/: ناو. نزگەرە ☰ سکسکه

**وەگرۆتش** / weg(i)rotiş/: چاوگ. لە سەرشان دانان؛ گرتنە کۆڵەوە ☰ کول کردن

**وەگلۆر** / weg(i)lor/: ئاوەڵناو. گلۆر؛ خلۆر؛ گلار ☰ غلتان

**وەگوڕهاتو** / weguřhatû/: ئاوەڵناو. ژووژیاگ؛ بووژاوە ☰ سرحال آمده

**وەگۆڕ**[1] / wegoř/: ناو. کاری شت بە شت گۆڕانەوە ☰ مُبادله

**- وەگۆڕ**[2]: پاشەوشە. وەگۆڕەوە ‹پارەوەگۆڕ› ☰ مُبادله‌کُن

**وەگۆڕین** / wegořîn/: چاوگ. گۆڕینەوە ☰ مُبادله کردن

**وەگەر** / weger/: ئامراز. ١. ئەگەریش؛ وە ئەگەر ٢. یا؛ وە یا ☰ ١. در صورتی که ٢. یا اینکه

**وەگەرد** / wegerd/: ئامراز. گەرد؛ دەگەڵ؛ لەتەک ☰ همراه

**وەگەرنە** / wegerne/: ئاوەڵکار. ئەنا؛ دەنا ☰ وگرنه

**وەگەڕ** / wegeř/: ئاوەڵناو. ١. لە سووڕاندا ٢. *[کنایە]* فێڵباز؛ بەحیلە ☰ ١. چرخان ٢. مکار؛ حیله‌گر

**وەگەڕان** / wegeřan/: چاوگ. گەڕیانەوە؛ وەگەڕانەوە؛ وەگەڕیانەوە: ١. گەڕانەوە؛ هەڵەوگەڕیان ‹وەک منالی کزی باب ئاوارە/ چاوەڕێ بوون وەگەڕێ دووبارە «هەژار، *بۆکوردستان*»› ٢.

گەڕاندنەوە؛ گێڕانەوەی قسە ≡ ١. بازگشتن ٢. بازگو کردن

**وەگەڕاندن / wegeřandin/**: ناو. گەڕاندنەوە؛ وەگەڕاندنەوە: ١. گێڕانەوە ٢. هەڵگەڕاندنەوە ≡ ١. بازگو کردن ٢. برگرداندن

**وەگەڕاندنەوە / wegeřand(i)newe/**: ☜ **وەگەڕاندن**

**وەگەڕانەوە / wegeřanewe/**: ☜ **وەگەڕان**

**وەگەڕاوی / wegeřawî/**: ناو. قاجایی؛ ئاوەژوویی؛ بەراوەژۆیی ≡ واژگونی

**وەگەڕیان / wegeřyan/**: چاوگ. با دانەوە؛ گەڕانەوە؛ هەڵگەڕانەوە؛ زڤرین ≡ برگشتن

**وەگەڕیانەوە / wegeřyanewe/**: ☜ **وەگەڕان**

**وەگەیین / wegeyîn/**: چاوگ. گەیشتن؛ پێ‌گەیین ‹وەگە تا بەشت نەخوراوە!› ≡ رسیدن

**وەگیریاییش / wegîryayîş/**: چاوگ. ١. لە کۆڵ کردن؛ گرتنە کۆڵ ٢. تل دان؛ ورەتاندن ٣. لە بەر تووڕەیی، ڕەنگ گۆڕان ≡ ١. کول کردن ٢. غلتیدن ٣. از شدت عصبانیت رنگ عوض کردن

**وەگێڕ / wegêř/**: ناو. ڕاوی؛ ئەوەی کە داستان یان هەواڵێک دەگێڕێتەوە ≡ راوی

**وەل¹ / wel/**: ناو. زەلکاو؛ باتلاخ ≡ باتلاق

**وەل²**: ئاوەڵناو. وێل؛ وڵ؛ بەرەڵدا ‹وەلی بکە با بچید!› ≡ ول؛ رها

⊡ **وەل بوون**: ناو. بەرەڵا بوون ≡ ول شدن

**وەل³**: ئامراز. دەگەڵ؛ لەگەڵ؛ لەتەک ‹وەل مـن بەو بچیمن› ≡ با؛ همراهِ

**وەلا¹ / wela/**: ئاوەڵناو. ڤالا؛ بەتاڵ؛ خاڵی ≡ خالی؛ تُهی

**وەلا²**: نزا. ولا؛ سوێند بە خوا ≡ بە خدا

**وەلات / welat/**: ☜ **وڵات**

**وەلاخەڕێ / welaxeřê/**: ☜ **وڵاخەڕێ**

**وەلاد / welad/**: ناو. وەلادەک؛ کەوێڵ؛ کۆختەی ناو باخ ≡ کلبەی کوچک درون باغ

**وەلادەک / weladek/**: ☜ **وەلاد**

**وەلاف / welaf/**: ناو. لەوەڕ؛ گیای وشکەوەبووی ئالف ≡ علوفەی خشک

**وەلاق / welaq/**: ناو. کاری دواندنی کچ بە تۆلازی ≡ عمل لاسیدن

**وەلالیک / welalîk/**: ناو. بەلالووک ≡ آلبالو

**وەلانراو / welan(i)raw/**: ناو. کارکەنار؛ لە کار دەرکراو ≡ برکنار شده

**وەلاییش / welayîş/**: چاوگ. باوێشک دان ≡ خمیازە کشیدن

**وەلجاخ / welcax/**: ☜ **وەلەجاخ**

**وەلچەک / welçek/**: ناو. وەلچەگ؛ پێوانەی دەخڵ کە چل کیلۆ دەگرێ ≡ عدل چهل کیلویی

**وەلچەگ / welçeg/**: ☜ **وەلچەك**

**وەلدین / weldîn/**: چاوگ. ١. منداڵ هێنان؛ زان؛ زایین ٢. لە دایک بوون ≡ ١. زاییدن ٢. متولد شدن

**وەلف / welf/**: ناو. دۆستی خۆشەویست ≡ دوست نزدیک

**وەلفەت / welfet/**: ناو. ئۆگری؛ چۆنیەتی خوو پێوەگرتن ≡ اُنس؛ اُلفت

**وەلل / well/**: ناو. نەرمەتۆز؛ تۆز و غوماری نەرم ≡ گرد و غبار

**وەللک / wellik/**: ناو. ١. کڕیوە ٢. کەڕەسیسە ≡ ١. کولاک ٢. دانەی برف ریز سبک

**وەللەروە / wellerwe/**: ناو. هەتوان لە خۆڵەکەوە و ڕۆن ≡ نوعی مرهم

**وەلن / welin/**: ئاوەڵناو. وەلنە؛ خۆڵاوی؛ تۆزاوی ≡ غبارآلود

**وەلنە / welne/**: ☜ **وەلن**

**وەلوەلە / welwele/**: ناو. دەنگ و هەرا و هوریا ‹ئەوی ئەمڕۆ بە دەوری تەختیایە هەلهەلەی مەخلووق/ لە دەوری نەعشیا سبحەی دەبینی وەلوەلەی مەخلووق

«مەحوی»» ☗ ولوله

**وەلە** / wele/: دەنگ. وتەی بانگ کـردن و ئـاژۆتنی گۆلک ☗ حرف خواندن و راندن گوساله

**وەلـەج** / welec/: نـاو. شـێلاقە؛ باڵـدارێکه بـه قـەد گاوانی بەلام لنگدرێژ ☗ پرندەی سلوا

**وەلـەجاخ** / welecax/: نـاو. وەلجـاخ؛ قـەزا و بـەلا؛ نەهاتی لە خواوە ☗ قضا و قدر

**وەلەد** / weled/: ناو. وەلەند؛ وەڵەد؛ ڕۆڵە؛ فرەزند ☗ فرزند

◘ **بە وەلەد بوون**: هاتنـە دنیـا؛ لـە دایـک بـوون ☗ متولد شدن

**وەلـەک** / welek/: ناو. ١. داردەستی سەر دوو حاچە ‹وەلەکێک، تووڵێک ئەدا لە ڕانی/ خەرقەی فڕێ دا لـە کزەی ژانی «پیرەمێرد»› ٢. گێژەڵووکە؛ گەردەلوول ٣. کرێوە؛ بەفری بە باوە ☗ ١. چوبدست دوشـاخە ٢. گردباد ٣. کولاک

**وەلەند** / welend/: ☜ **وەلەد**

**وەلـەو** / welew/: ئاوەڵکار. ئەگەرچی؛ خۆ ئەگـەر ☗ ولو؛ اگرچه

**وەلی** / welî/: نـاو. پیاوی خوا؛ قەدیسی موسوڵمانان ☗ مرد خدا

**وەلیعەهـد** / welî'ehd/: نـاو. ئــەو کەســەی لــە سەرینایەتی پادشادا، بۆ جێگری ئەو ناودێر دەکرێ ☗ ولیعهد

**وەلێ**[1] / welê/: ئاوەڵکار. ئاوا؛ ئاوەها ☗ اینطور

**وەلێ**[2]: ئامراز. وەلێکان؛ وەڵـێ؛ بـەلام؛ بـەلان؛ بـلام ‹وەلێ لوانت بەی تەور بە دەو بۆ/ شۆ وە لای شـیرین، هێمان نە خەو بۆ «سەیدی»› ☗ لیکن

**وەلێکان** / welêkan/: ☜ **وەلێ**[2]

**وەڵات** / wełat/: ☜ **وڵات**

**وەڵاتپارێز** / wełatparêz/: ☜ **وڵاتپارێز**

**وەڵاتی** / wełatî/: ناو/ ئاوەڵناو. خـۆوڵاتی؛ هاوزێـدی؛ هاووڵاتی ☗ هم‌ولایتی

**وەڵاتینـی** / wełatînî/: نـاو. هاونیشـــتمانیەتی ☗ هم‌میهنی

**وەڵاخەڕێ** / wełaxeřê/: ☜ **وڵاخەڕێ**

**وەڵاشم** / wełaşim/: ☜ **وڵاشم**

**وەڵام** / wełam/: ☜ **وەرام**

◘ **وەڵام دانەوە**: ☜ **وەرام دانەوە**

**وەڵام ناردن**: ☜ **وەرام ناردن**

**وەڵامـدەر** / wełamder/: نـاو/ ئاوەڵـناو. وەرامــدەر؛ جـواودەر؛ جوابـدەر؛ پەرسڤـدەر؛ ئـەوەی وەرامـی پرسیاران دەداتەوە ‹بەرپرسی مەزرینگە وەڵامـدەری پرسیارەکانتانە› ☗ پاسخگو

**وەڵامە** / wełame/: ☜ **وڵامە**

**وەڵاو** / weław/: ☜ **بڵاو**

**وەڵکـرد** / wełkird/: نـاو. ڕەوتی حاوانــەوە؛ ژیــان ڕابواردن ☗ گذران

**وەڵگ** / wełg/: ناو. بەڵگ؛ وەڵنگە؛ گەڵا ☗ برگ

**وەڵڵا** / wełła/: نزا. سوێند بە خوا ☗ به خدا

**وەڵنگە** / wełinge/: ☜ **وەڵگ**

**وەڵەد**[1] / wełed/: ناو. ١. ☜ **وەلەد** ٢. بەڵـەد ☗ ١. ☜ **وەلەد** ٢. راهنما؛ راەشناس

**وەڵەد**[2]: ئاوەڵناو. بەڵەد؛ شارەزا ☗ بَلَد

**وەڵەک** / wełek/: ئاوەڵناو. بەڵەک ☗ خلنگ

**وەڵیفەت**[1] / wełîfet/: ☜ **وەڵیفەتانە**

**وەڵیفەت**[2]: ئاوەڵناو. مفتە؛ خۆڕایی؛ بەلاش؛ مفـت ☗ مُفت

**وەڵیفەتانـە** / wełîfetane/: نـاو. ولفـەت؛ ولـیفەت؛ وڵیفەتانە؛ وەڵیفەت؛ سەرقەڵەمانە ☗ مُزد دعانویس

**وەڵین** / wełîn/: ئاوەڵناو. بەرگین؛ پێشـوو؛ سـەر بـە ڕابردوو ☗ پیشین

**وەڵیەفەتی** / wełyefetî/: ☜ **وڵیەفەتی**

**وەڵێ** / wełê/: ☜ **وەلێ**[2]

**وەڵێنە** / wełêne/: ئاوەڵـکار. سـەرەتا؛ لـە هـەوەڵا؛ لەبەرا ☗ ابتدا

**وەم** / wem/: ئامراز. بەم؛ ئەم ‹وەو جۆرەت کرد وا وەم جۆرەت سەر هات «قسەی نەستەق»› ☰ بدین

**وەماشتن** / wemaştin/: چاوگ. وەماڵین؛ ماڵینەوە؛ ماشتنەوە؛ ڕادان و بردنی هەموو شتێ ☰ روبیدن و بُردن

**وەمالین** / wemalîn/: چاوگ. ماڵینەوە؛ ماشتنەوە ☰ روبیدن و بُردن

**وەماڵین** / wemalîn/: ☜ وەماشتن

**وەمان** / weman/: چاوگ. بەجێ مان و دوا کەوتن لە کارێ ☰ جا ماندن

**وەماو** / wemaw/: ئاوەڵناو. وەمای؛ جێماو؛ جێماگ ☰ جامانده

**وەمای** / wemay/: ☜ وەماو

**وەن**[1] / wen/: ناو. ١. بەن؛ دەزوو؛ داوی بادراوی خوری ٢. دارەبەن ٣. سەد؛ بەنداو ☰ ١. نخ پشمی ٢. درخت بنه ٣. سد

• **وەن**[2]: پاشەوشە. ١. ـ هۆن؛ هۆندراو ‹گورزەوەن› ٢. ـ بەن؛ بەستراو ‹پاوەن؛ بازیوەن› ٣. ـ بەند؛ شوێن؛ جێگە ‹ئەڵوەن› ٤. کۆ؛ کۆمەڵ ‹زەماوەن› ٥. ـ خوێن؛ بخوێن ‹دەرسوەن› ☰ ١. ـ بافت ٢. ـ بند ٣. جا؛ مکان ۴. گروه ۵. ـ خوان

• **وەن**[3]: پاشگر. ـ وەند؛ نیشانەی پەیوەندی ‹کاکاوەن؛ حاجیوەن؛ هەمەوەن› ☰ ـ وند

**وەناخێر** / wenxêr/: سارستە. بە ناخێر؛ ناسلامەتی؛ بە زیادنەبێ؛ بە لای خێر/ شەڕەوە؛ وشەی بەرهەڵستی بە ڕووداو یان دۆخێک، بە واتا «بریا وا نەبووبا» ‹وا بەرەی پێگەییشتوومان، وەناخێر پێگەییشتوومان، شتی خۆ لە لا دزیوە «هەژار، *چوار نامیلکە*»› ☰ ناسلامتی

**وەناق** / wenaq/: ناو. دووشاخە؛ پێران؛ قاس؛ بوغمە؛ بەغمە؛ وناخ؛ نەخۆشییەکی گیرۆیە لە جۆری باسیل سەر هەڵدەدا و تۆژاڵێکی نووستەک لە سەر گەروو، قورقوڕانچک و بڕێجار چاو و شەرمی ژن دروست دەکا ☰ دیفتری

**وەناو** / wenaw/: ناو. بناو؛ بناڤ ☰ درخت زبان گنجشک

**وەنای** / wenay/: چاوگ. وانای؛ خوێندن؛ فێرە خوێندن بوون ☰ درس خواندن

**وەنایا** / wenaya/: ناو. بارەبەرێ کە سواریشی دەبن ☰ باربری که سواری هم بدهد

**وەنایش** / wenayîş/: چاوگ. ١. بارکردن؛ کۆچ لێنان ٢. سواری بارەبەر بوون ☰ ١. کوچ کردن ٢. سوار باربر شدن

**وەنتەی** / wentey/: چاوگ. خوێندن ☰ خواندن

**وەنجەنە** / wencene/: ناو. هۆجەنە؛ دۆخین؛ دێخوون ☰ بند تُنبان

**وەند**[1] / wend/: ناو. ١. ئێش؛ ئازار ٢. پارچەیەک لە گۆرانی ٣. بەند؛ ئاوەبەند؛ سەد ٤. بەرگر؛ لەمپەر ٥. جمگە؛ بەندی ئێسقان ☰ ١. آزار؛ درد ٢. قطعه‌ای از ترانه ٣. سد ۴. مانع ۵. مفصل

**وەند**[2]: ئاوەڵناو. ئازا؛ نەترس؛ بوێر ☰ شُجاع؛ دلیر

• **وەند**[3]: پاشەوشە. ١. هۆندراو ‹ترمەوەند› ٢. بەن؛ بەند؛ بەستراو ‹کەمەروەند؛ بازیوەند› ٣. کۆ؛ کۆمەڵ ‹گۆوەند› ٤. ـ وەن؛ شوێن؛ جێگە ‹ئەلوەند› ٥. خەڵک؛ وەماو ‹شاروەند› ☰ ١. ـ بافت ٢. ـ بند ٣. گروه ۴. جا ۵. ـ وند

**وەندا** / wenda/: ئاوەڵناو. ١. تایبەتمەندی ژن و کچی خوێندەوار ٢. ☜ **وندا** ☰ ١. ویژگی زن و دختر باسواد ٢. ☜ **وندا**

**وەندانە** / wendane/: ئاوەڵکار. ئازایانە؛ بوێرانە ☰ شُجاعانه

**وەندس** / wendis/: ☜ **وەندش**

**وەندش** / wendiş/: چاوگ. وەندس؛ خوێندنەوە؛ وەخوێندن ☰ مطالعه کردن

**وەندن** / wendin/: ☜ **هۆندنەوە**

**وەندنەوە** / wend(i)newe/: ☜ **هۆندنەوە**

**وەندۆخ**[1] / wendox/: ناو. گۆرانی خوێن ☰ خواننده

**وەندۆخ**[2]: ئاوەڵناو. خوێندەوار ☰ باسواد

**وەندە**[1] / wende/: ناو. ١. زبارە؛ هەرەوەز ٢. جمگە ئێسک؛ بەند ‹سێ وەندەی پشتم ئێشێ› ☰ ١. کار گروهی ٢. بند استخوان

**. وەندە**[2]: پاشەوشە. ١. خاوەن ‹جووت‌وەندە› ٢. ـ وان؛ بەس ‹خەروەندە› ☰ ١. صاحب؛ سرپرست ٢. ـ بان

**وەندەن** / wenden/: ناو. ١. بەرزایی؛ قەدی چیا ٢. پردی لە چەپەر ☰ ١. کمر کوه ٢. پُل ترکه‌یی

**وەندەنە** / wendene/: چاوگ. ١. خوێندن؛ دەرس فێر بوون ٢. خوێندنی مەل و مرۆی دەنگ خۆش ☰ ١. درس خواندن ٢. آواز خواندن پرنده و آدم خوش‌نوا

**وەندەی** / wendey/: چاوگ. دەرس خوێندن ☰ درس خواندن

**وەنسە** / wense/: ناو. هۆگری؛ چۆنیەتی خوو پێ‌گرتن ☰ اُنس

**وەنشتا** / wenişta/: ☜ وەنشتش

**وەنشتش** / wenîştiş/: چاوگ. وەنشتا؛ سوار بوون ☰ سوار شدن؛ برنشستن

**وەنگ** / weng/: ناو. جومگە ☰ مفصل

**وەنگە** / wenge/: ناو. جێگەبەنداو ☰ جای سد

**وەنۆڵە** / wenołe/: ناو. گیایەکە ☰ گیاهی است

**وەنوشتاو** / wenûştaw/: ئاوەڵناو. دەقکراو؛ قەدکراو ☰ تاکرده؛ تاشده

**وەنە**[1] / wene/: ☜ بەندە[1]

**وەنە**[2]: ئاوەڵناو. وەندراو ☰ بافته

**وەنە**[3]: ئامراز. لێ ‹ کەوت وەنەم؛ داش وەنەت› ☰ از کسی؛ به چیزی

**وەنەبێ** / wenebê/: ئامراز. وەنەوێ؛ نەوەکوو؛ وەها نییە ☰ چنین نیست

**وەنەتەق** / weneteq/: ناو. ١. قەزوان؛ قسقەوان؛ قەزقەوان؛ بەری دار وەن ٢. بنەوشیلە؛ جۆرە دارەقەزوانێکە بەرەکەی وردە ☰ ١. نانکش ٢. چاتلانقوش

**وەنەدی** / wenedî/: ناو. سندوق‌جام؛ قاپ‌ئاوێنە؛ جابەی لە شیشە ☰ جعبه‌ی شیشه‌ای

**وەنەدیک** / wenedîk/: ناو. شیشە؛ شووشە ☰ شیشه

**وەنەسیاوێ** / wenes(i)yawê/: ناو. ڕەشەقەزوان؛ ڕەشەوەن ☰ بنه‌ی کوهی

**وەنەشامی** / weneşamî/: ناو. بادامزەوینی؛ بەهێڤەشامی ☰ بادام‌زمینی

**وەنەمشک** / wenemişk/: ناو. وەنەتەق؛ بنەوشیلە ☰ نوعی درخت بنه

**وەنەن** / wenen/: ناو. پردی بە دار و تەناف سازکراو ‹وەنەن هەجیج› ☰ پُل ترکه‌ای

**وەنەنە** / wenene/: ناو. لەرەلەر؛ جوولەجوول ‹خاس بیوەسە با وەنەنە نەکا› ☰ لرزش؛ تکان

**وەنەوز** / wenewz/: ناو. وەنەوزە؛ خەوەنووچکە؛ خەونووچکە؛ خەونیچکە؛ خەونسکێ؛ نوقرشک؛ نوقورشک؛ نوقرسک؛ قنگەخەو؛ چۆرت؛ چرت؛ ئەنووس؛ ئەنووز؛ هونژەک؛ وەژینگ؛ وێژینگ؛ وێژنگ؛ وێزەنگ؛ وێژنە؛ ورینگە؛ وریني؛ دۆخی خەو لێ‌کەوتنی زۆر کورت ‹داپیرەم چەندێک لە ناو سینەمدا/ پارێزگاری کرد وەنەوزی نەدا «پیرەمێرد»› ☰ چُرت

⊡ **وەنەوز بردنەوە**: ☜ **وەنەوز دان**

**وەنەوز دان**: وەنەوز بردنەوە؛ چۆرت دان ☰ پینکی زدن

**وەنەوزە** / wenewze/: ☜ وەنەوز

**وەنەوزەکوتێ** / wenewzekutê/: ناو. کاری چۆرت دان ☰ عمل پینکی زدن

**وەنەوزیای** / wenewzyay/: چاوگ. وەنەوز بردنەوە ☰ چُرت زدن

**وەنەوش**[1] / wenewş/: ناو. ١. بنەوش؛ مۆر؛

تێکەڵاوی سوور و ئاوی؛ ڕەنگی خوارووی پەلکەزێڕینە ٢. ☜ **وەنەوشە** ≡ ١. رنگ بنفش ٢. ☜ **وەنەوشە**

**وەنەوش**[٢]: ئاوەڵناو. بنەوش؛ وەنەوشی ≡ بنفش رنگ

**وەنەوشە** / wenewşe/: ناو. وەنەوش؛ بنەوشە؛ بەنەوشە؛ مەنەوەشە؛ بنەفش؛ نەڤش؛ بەناوشە: ١. بنەگیایەکی جوانکەلەیە بە چەن جۆرە گوڵی چکۆلەی بۆنخۆشەوە ٢. گوڵی ئەو گیا ≡ ١و٢. بنفشه

**وەنەوشەیی** / wenewşeyî/: ☜ **وەنەوشی**

**وەنەوشی** / wenewşî/: ئاوەڵناو. وەنەوشەیی؛ مۆر؛ بە ڕەنگی وەنەوشە ≡ بنفش رنگ

**وەنەی** / weney/: چاوگ. خوێندن ≡ خواندن

**وەنی** / wenî/: ناو. ١. قەزوان؛ قەسقەوان ٢. وەنە؛ بەنی؛ خولام ≡ ١. بنه ٢. بنده؛ برده

**وەنیشتە** / wenîşte/: ئاوەڵناو. تەقاویت؛ خانەنشین؛ کارکەنار ≡ بازنشسته

**وەنین** / wenîn/: ☜ **هۆندنەوە**

**وەو**[١] / wew/: ئامراز. وەی؛ بەو ‹وەو جۆرەت کرد وەم جۆرەت برد «قسەی نەستەق»› ≡ بدان

**وەو**[٢]: پیت. بەو؛ بە ئەو ‹وەو سەی سادقە، وەو میری سووره/ دڵم هەر بۆ تۆ چەشنی تەنووره «قانع»› ≡ به آن

**وەو**[٣]: دەنگ. ئا؛ بەڵێ ‹ـ هۆ مام پیرۆت! ـ وەو› ≡ بله؛ ها

**وەوتۆ** / wewto/: ئاوەڵکار. بەم جۆرە ≡ چنین

**وەور** / wewr/: ناو. بەفر ‹جە شنۆی شەماڵ هەوای تۆف وەور/ بەتاڵ کەرد شۆڵەی مەخشەلان دەور «میرزا شەفیع پاوەیی»› ≡ برف

**وەوش** / wewş/: دەنگ. چۆش؛ شۆش؛ وش؛ وشکە؛ وەش؛ دەنگی ڕاگرتنی چوارپێ ≡ هُش

**وەوڵە** / wewłe/: ☜ **وەویلە**

**وەوڵەبارانێ** / wewłebaranê/: ☜ **وەویلەبارانێ**

**وەوولە** / wewule/: ☜ **وەویلە**

**وەوو** / wewû/: ☜ **وەوی**

**وەوە** / wewe/: ناو. ١. بەبە؛ بەبەکە؛ منداڵی ساوا ٢. ئێخە؛ جێگەی مل لە کراس ≡ ١. نوزاد؛ نی‌نی ٢. یقه؛ گریبان

**وەوی** / wewî/: ناو. وەیوە؛ وەوو؛ وەهی؛ وەی؛ وەیوو: ١. تازە بووک ٢. بووک؛ ژنی کوڕ ‹وەوییەکەمان پەرەستارە› ٣. وەویلە؛ وەویلکە ≡ ١. نوعروس ٢. عروس ٣. عروسک

**وەویلکە** / wewîlke/: ☜ **وەویلە**

**وەویلە** / wewîle/: ناو. وەوڵە؛ وەوی؛ وەیووڵە؛ وەیووڵێ؛ وەووڵە؛ وەویلکە؛ وەویە؛ وەیلکان؛ وەیولێ؛ ویلکان؛ بووکەڵەی منداڵان ≡ عروسک

**وەویلەبارانێ** / wewîlebaranê/: ناو. وەوڵەبارانێ؛ بووکەبارانە ≡ افچه بارانی

**وەویە** / wew(i)ye/: ☜ **وەویلە**

**وەویەتی** / wew(i)yetî/: ناو. بووکێنی ≡ حالت عروس بودن

**وەه** / weh/: دەنگ. ١. پەح؛ تەح؛ تەحا؛ وتەی سەیرمان ‹وەه لەم گەرمایە!› ٢. وتەی زۆر پەسند کردن و خۆشی ‹وەه چ خۆشە تا سبەینێ دەم لە سەر غونچەی دەمی/ من وەکوو بولبول بناڵم، ئەو بخوێنێ چەشنی کەو «بێخود»› ≡ ١. وه؛ حرف تعجب ٢. به؛ حرف تحسین و پسند

**وەها**[١] / weha/: ناو. ١. بەها؛ نرخ؛ قیمەت ٢. شیناوی و ئاو لە ناو بیابانـدا ≡ ١. بها ٢. آب و دار و درخت در بیابان

**وەها**[٢]: ئاوەڵناو. وا؛ بەمشێوە؛ لەم چەشنە ‹کاری وەها نەکەی هەرگیز› ≡ چنان

**وەها**[٣]: ئاوەڵکار. ١. ئاوها؛ بەو جۆرە ‹واز لە عالەم بێنە، دانیشە، بەرۆکمان بەر بدە!/ مەلعەنەت بەسیە هەتا کەی خۆت وەها ڕیسوا ئەکەی؟ «بێکەس»› ٢. بەجۆرێ؛ بەئەندازەیێ ‹وەها مەستی تەماشای چاوتە

**ـ هاتـوو** / hatû-/: پاشوشە. هـاتی: ١. هاتیـار ‹لێهـاتوو؛ بارهـاتوو› ٢. گەیشـتوو ‹تازەهـاتوو؛ دیرهاتوو› ١و٢. ـ آمده

**هاتـور** / hatûr/: نـاو. تـێلای زل کـە گـێچ و شتیتری پێ ورد دەکەن چُماق بـزرگ بـرای کوبیدن گچ و امثال آن

**هاتون** / hatûn/: نـاو. ١. توون؛ ئـاگردانی حـەمام ٢. دۆژەه؛ جەحەندەم ١. گُلخن ٢. جهنم

**هاتە** / hate/: ناو. ١. هات؛ بەخت؛ تالح ٢. بـیرێ کە ئەکەوێتە دڵەوە ١. شانس ٢. خاطره

**هاتەر** / hater/: ناو. ئاتەر؛ ئاور؛ ئاگر؛ ئایەر آتش

**هاتـەران** / hateran/: نـاو. وڕاوە؛ وڕێنـە؛ ئاتـەران ‹شێتی وەکـوو مـن بـە پـێچ و گێـژی/ هـەر ناڵـەتە هاتەران دەبێژی «هەژار، *مەم و زین*»› هذیان

**هاتەران پاتـەران** / hateran pateran/: ناو. ئاتەران ـ پاتـەران؛ هەڵـیانوپەڵـیان؛ هەڵـیتوپەڵـیت؛ هاران‌ماران؛ قسەی بـێمانـا و هـیچ و پـووچ ‹... وەختێ کاروان ڕەوانە بوو، بابیان گوتی: ئەگەر نـەیژن هاتەران ـ پاتەرانـی گوت، من بۆنی یۆسـفم بـۆ دێ «هەژار، *قورئان*»› پرت‌وپلا؛ شِرووِر

**هاتەرێ‌ماتـــەرێ** / haterêmaterê/: سارِســـــە. هەلاوەمـــــەلاوە؛ دەســــتەواژەی تایبــــەتی جێژنـەپـیرۆزەی نـەورۆز، کـە زۆرتـر منـداڵان دەیڵێنەوە و جێژنانە وەردەگرن (دەچنە سـەربانان و دەڵێن: هاتەرێ‌ماتەرێ/ پیرۆزیتان بێتە سەرێ/ لـە ماڵانیشـەوە خـای سـوورکراویان ئـەدەنێ «بـەیتی کوردی») اصطلاح کودکانەی تبریک عید نوروز

**هاتـەهات** / hatehat/: نـاو. هـات‌هـات؛ هاتەهاتـە؛ دەنگۆی هـاتنی کـەس یـان کۆمەڵـێک بـە درۆ ‹کوڕە هەر نـەهات! بـوو بـە هاتەهاتـی ڕۆمـێ!› شایعەی دروغین آمدن کسی یا جمعی

**هاتەهاتە** / hatehate/: هاتەهات

**هات‌هات** / hathat/: هاتەهات

**هاتی**[١] / hatî/: ناو. هات؛ بەخت شانس

**هاتی**[٢]: هات[٢]

**. هاتی**[٢]: ـ هاتوو

**هاج**[١] / hac/: پێرۆ. ← هاروهاج

**هاج**[٢]: لێل. ← هاجوواج

**هاجاڕ** / hacař/: ناو. پنجاڕ؛ بنەگیایەکـە ئـەخورێ بوتەگیاهی خوردنی

**هاجاس** / hacas/: ناو. ١. ناوبژیکاری؛ ناوجیکـەری ٢. ناوبژی؛ ناوجی؛ هاجاس‌کـەر؛ ناوبژیکـەر ١. میانجیگری ٢. میانجی

**هاجاس‌کەر** / hacasker/: هاجاس ـ٢

**هاجڕەشک** / hacřeşik/: هەجهەجك

**هـاجوواج** / hac û wac/: ناوەڵـناو. هـاژوواژ؛ حەپەساو؛ گێژ و وێژ هاج و واج؛ مات و مبهوت

**هاجوج** / hacûc/: ناو. عاجووج؛ ئاجووج یأجوج

**هاجە** / hace/: ناو. هاچە؛ داوێـنی چـادر دامـن خیمە

**هاجەت** / hacet/: نـاو. حاجەت؛ ئەسـپابی مـاڵ لوازم منزل

**هاجهاجک** / hachacik/: هەجهەجك

**هاجی‌بایف** / hacîbayif/: حاجی‌بایف

**هاچار** / haçar/: هاچەر

**هاچە** / haçe/: ناو. ١. حاچە؛ فاقـە؛ لکـی دوولقـە ‹دارێکـی دووهاچـەی هێنـا› ٢. هاجـە ١. چوب دوشاخە ٢. هاجە

**هاچەر** / haçer/: ناو. ئاچار؛ ئاچەر؛ هاچار؛ هەچەر: ١. ئـامێری کردنـەوەی مـۆرەی پـێچ ٢. کلیـل؛ کلێل؛ ئامێری کردنەوەی قوڵف ١. آچار ٢. کلید

**هاچەرفـــەڕانســـە** / haçerfeřanse/: نـــاو. ئاچەرفەڕانسە؛ ئاچەرێ کـە دەمەکـەی گـەورە و گچکە دەکرێتەوە آچار فرانسە

**هـادار** / hadar/: ناوەڵناو. ئـادار؛ نـەجووڵ؛ بـێ‌بـزاو ‹هاداری بە سـەر پـاداروە نەهێشـت «مەسـەل»›

بی‌حرکت؛ ساکن

**هادر** / hadir/: ☜ **هادری**

**هادری** / had(i)rî/: ئاوەڵکار. هادر؛ دەسبەجێ؛ بەبێ درەنگ کردن ☰ فوراً

**هار** / har/: ئاوەڵناو. ١. تووشیاری نەخۆشی هاری ‹هەر کەسێ تۆی بێ، نەجیب و خانەدانی پێ ئەڵێن/ وەک ئەرەستۆ، تۆی دەوابەخشی نەخۆش و شێت و هار! «موفتی پێنجوێنی»› ٢. [کنایە] بەدفەڕ و بەئازار ‹خەلەستی لە دەم هار و مار/ تەکییەوە لەو ژینی گەمار «هەژار، بۆ کوردستان»› ٣. [کنایە] زیرەک و وریا ‹ئەو هارە پەکی ناکەوێ› ٤. [کنایە] هاروهاج؛ ئۆقرەنەگر؛ بێ‌ئارام ‹مندالی هار› ☰ ١. هار ٢. مردم‌آزار ٣. زبر و زرنگ ۴. ناآرام

▣ **هار بون:** ١. تووشی نەخۆشی هاری هاتن ٢. [کنایە] بەدفەڕ بوون ☰ ١. هار شدن ٢. مردم آزار بودن

**هارام** / haram/: ☜ **نارام**[2]

**هارانماران** / haranmaran/: ☜ **هاتەران‌پاتەران**

**هارتوهورت** / hart û hurt/: ☜ **هات‌وهووت**

**هارد** / hard/: ناو. ١. ئارد ٢. حافزە و بیری کۆمپیوتەر ☰ ١. آرد ٢. هارددیسک

**هارداوی** / hardawî/: ☜ **ئارداوی**

**هارزەو** / harzew/: ناو. وشکی؛ وشکانی ☰ خُشکی

**هارژن** / harjin/: ☜ **هەرجن**

**هارسم** / harsim/: ناو. ١. بەرسیلە ٢. ئاوی بەرسیلە ☰ ١. غورە ٢. آبغورە

**هارمەندە** / harmende/: ئاوەڵناو. تووشیاری هاری (تووکێکە ژن ئەیکەن، واتا: هار بی، تووشی ئەو نەخۆشییە بی کە سەگی پێ هار دەبێ) ☰ نفرین زنانە

**هارمێ** / harmê/: ☜ **هەرمێ**

**هاروە** / harwe/: ☜ **هارو-٣**

**هاروهاج** / har û hac/: ئاوەڵناو. هارهاج: ١. بزۆز و ئۆقرەنەگر ٢. [مەجاز] شەڕفرۆش و بەتەشقەڵە ☰ ١. بازیگوش ٢. ستیزەجو

**هاروهاجی** / har û hacî/: ناو. بزۆزی؛ شلۆقی ‹هەر منداڵێک هاروهاجی بکردایە، پەتی فەلاقەی لە لاقی با دەدرا و ... «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ شلوغ‌بازی

**هاروێ** / harwê/: ☜ **هارو**

**هارۆ** / haro/: ☜ **نارۆ**

**هارو** / harû/: ناو. هاروێ: ١. پووک؛ پدوو ٢. ئاروو؛ خەیار ٣. هاروە؛ شەویلکە؛ شەویلاکە ☰ ١. لثه ٢. خیار ٣. آرواره

**هاروتی** / harûtî/: ناو. جادووگەر؛ جادووباز ☰ جادوگر

**هاروژان** / harûjan/: ☜ **وروژان**

**هاروژاندن** / harûjandin/: ☜ **وروژاندن**

**هاروژاو** / harûjaw/: ☜ **وروژاو**

**هارە** / hare/: ناو. ١. دوو بەردی پان و قورس و ئەستووری خڕ بۆ ورد کردنی دانەوێڵە ‹هارە سەختەنی، هارە سەختەنی/ تۆ خۆ کەم قیمەت، سەنگ سەختەنی «سەیدی»› ٢. بەرداش؛ بەردی ئاش ☰ ١. سنگ دستاس ٢. سنگ آسیا

▣ **هارە کردن:** ١. هاڕینی دانەوێڵە بە هارە ٢. [کنایە] قسەی بێتام و نابەجێ کردن ☰ ١. دستاس کردن ٢. حرف مُفت زدن

**هارەق** / hareq/: ☜ **نارەق -١**

**هارەکڕ** / harekiř/: ناو. دەستاڕ ☰ دستاس

**هارەگڵ** / haregil/: ناو. ١. جۆرێ خاکی ئاماڵ زەردە، بۆ دار تێدا چاندن نابێ ٢. شوێنێ لە زەوی کە لەو خاکە بێ ☰ ١. نوعی خاک بی ٢. زمین حاوی آن نوع خاک

**هارەلەقی** / hareleqî/: ناو. لەرە؛ لرە؛ لەرزە ☰ لرزش

**هارەماسی / haremasî/:** ☜ **هەڕەماسی**

**هاری / harî/:** ناو. ١. سەگەناز؛ هەرەش؛ هەرەژ؛ درمێکی ویرووسییە لە لیکی گورگ و سەگی نەخۆشەوە تووشی مرۆ دەبێ و لە کۆندامی دەماریدا خۆ پیشان دەدا و شێتی و شەپلە و مەرگی لە دوو دێت ٢. ئاری؛ ئاریکاری ٣. *[کینایە]* شەڕفرۆشی و ئازاری خەڵک ⇐ ١. هاری ٢. یاری ٣. ستیزەجویی و مردمآزاری

**هاریای / haryay/:** ئاوەڵناو. تەشەنەکردوو؛ پەرەگرتوو (زام یان نەخۆشی) ⇐ پیشرفتە (زخم یا بیماری)

**هاریکار / harîkar/:** ☜ **ئاریکار**

**هاریکاری / harîkarî/:** ☜ **ئاریکاری**

**هاریکەر / harîker/:** ☜ **ئاریکار**

**هارێ / harê/:** ناو. بەڵێ؛ ئارێ ⇐ آری

**هاڕ[1] / hař/:** ناو. ١. بەرداش؛ بەردی ئاش ٢. ئامرازی ورد کردن و وەک ئارد پێ کردن ⇐ ١. سنگ آسیا ٢. خُردکُن

• **هاڕ[2]:** ☜ **ـ هاڕین**

**هاڕئاسیاو / hařasyaw/:** ناو. بەرداش؛ بەردی ئاش ⇐ سنگ آسیاب

**هاڕان / hařan/:** چاوگ. هاڕیان؛ ورد بوون؛ بە ئارد بوون ⇐ آرد شدن

**هاڕاندن / hařandin/:** چاوگ. تێپەڕ. تێنەپەڕ. //هاڕاندت؛ دەهاڕێنی؛ بهاڕێنە// □ تێپەڕ. ١. ورد کردن وەک ئارد □ تێنەپەڕ. ٢. نارەتە لێ دان ⇐ ١. خُرد کردن ٢. نعره زدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەهاڕاندن

**هاڕاو / hařaw/:** ☜ **هاڕدراو**

**هاڕاوە / hařawe/:** ☜ **هاڕدراو**

**هاڕای / hařay/:** چاوگ. هاڕین ⇐ آسیاب کردن

**هاڕدران / hard(i)ran/:** چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //هاڕدرای؛ دەهاڕدرێی؛ بهاڕدرێ// وە بەر هاڕین کەوتن ⇐ آرد شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: هاڕدراو/ چاوگی نەرێنی: نەهاڕدران

**هاڕدراو / hařd(i)raw/:** ئاوەڵناو. هاڕاو؛ هاڕاوە؛ هاڕڕاو؛ هاڕڕاوە؛ هاڕدراوە؛ هاڕیاگ؛ هاڕیاو؛ وردکراو وەک ئاردی لێ هاتوو ⇐ آرد شده

**هاڕدراوە / hařdrawe/:** ☜ **هاڕدراو**

**هاڕدڕاو / hařdiřaw/:** ئاوەڵناو. ڤەهێڕیای؛ هاڕاو ⇐ ساییدە؛ آسیاب شده

**هاڕڕاو / hařřaw/:** ☜ **هاڕدراو**

**هاڕڕاوە / hařřawe/:** ☜ **هاڕدراو**

**هاڕڕە / hařře/:** دەنگەناو. دەنگی زۆر بە تەوژمی دڵ‌لەرزێن ⇐ غُرُّنبە

**هاڕۆسارە / hařosare/:** ناو. ئەمڕۆ سبەی؛ کاری تەفرەدان ⇐ تعویق

**هاڕە / haře/:** ناو. ١. هاڕڕە؛ نەعرەتە؛ نارەتە «لە بەر هاڕەی گۆبەرۆک و گوارە و کرمەک و ژێرچەنە/ نیوەڕۆیە لەبەر بێزێ کۆڕی مەڕی رادەپەڕی «هێمن»» ٢. بەرداش؛ بەردی ئاش ٣. هاڕێ؛ ترترە؛ ئامرازی کۆن و نیوەکارە ⇐ ١. نعره ٢. سنگ آسیا ٣. قارقارک

⊡ **هاڕە کردن** ١. نەڕاندن؛ بۆڕاندن ٢. داڕووخان؛ تێکڕووخانی شتی گەورە و قورس (وەک: چیا) «دەستیان لە جادەکە دا، کێو هاڕەی کرد بەرەو خوار» ⇐ ١. نعره زدن ٢. فروریختن

**هاڕەدەسی / haředesî/:** ناو. دەستاڕ ⇐ دستاس

**هاڕەگل / hařegil/:** ناو. ١. دەستاڕ ٢. جوون؛ بەردی لە جێگەی دەسکاونگ ⇐ ١. دستاس ٢. هاون سنگی

**هاڕەماسی / hařemasî/:** ☜ **هەڕەماسی**

**هاڕەهاڕ / hařehař/:** دەنگەناو. هاڕەی زۆر؛ دەنگی زەلامی بەسام «گیاندار و بێ‌گیان، زەوی و گیا و دار/ خرۆشاو و زەلمیش کەوتە هاڕەهاڕ «پیرەمێرد»»

🇮🇷 غُرُبەی پیابی

**هاڕیاگ** / hařyag/: ☜ **هاڕدراو**

**هاڕیان** / hařyan/: چاوگ. ١. ☜ **هاڕین** ٢. ☜ **هاڕان**

**هاڕیاو** / hařyaw/: ☜ **هاڕدراو**

**هاڕیای** / hařyay/: چاوگ. هاڕدران 🇮🇷 آسیاب شدن

**هاڕین** / hařîn/: چاوگ. تێـەڕ. //هاڕیت؛ دەهـاڕی؛ بهاڕە// ئاڕین؛ هاڕین؛ هەڕین؛ هیرتن؛ ورد کـردن وەک ئارد ‹بپەڕێنێ دەستی جەللاد/ بهاڕێ ساتۆری بێداد «هێمن»› 🇮🇷 آرد کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەهاڕین

**هاڕینەوە** / hařînewe/: چـاوگ. تێـەڕ. //هاڕیتـەوە؛ دەهاڕییەوە؛ بهاڕەوە// وەک ئارد ورد کـردن ‹ئـەم دەرمانـە بهـاڕەوە و دە چـاوتی کـە!› 🇮🇷 کوبیـدن و آسیاب کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: نەهاڕینەوە

**هاڕیە** / hařye/: ناو. تڕتڕە؛ کرمی دار و شینایی 🇮🇷 کرم آفت سبزی و درخت

**هاڕێ** / hařê/: ☜ **هاڕە ـ٣**

**ـ هاڕێن** / hařên/: پاشەوشـە. ـــ هـاڕ؛ وردکـەر 🇮🇷 خُردکُن

**هاز** / haz/: نـاو. ١. ☜ **کـاردوو** ٢. پیازەخووگانـە ٣. هـازی؛ هێـز؛ قـەوەت ‹هـازم نـەبوو هـەنگاو هەڵـێنم!› ٤. گیایـەکی گـەڵاپانی زۆر توونـە بـۆ دۆڵمە و بۆ ناو بـڕێ چێشـت بـەکـارە 🇮🇷 ١. ☜ **کاردوو** ٢. گیاهی شـبیه پیـاز ٣. نـا؛ تـوان ۴. گیـاهی خوراکی

**هازا** / haza/: ئاوەڵکار. ١. ئێـرە؛ ئـەیرە ٢. لـەوێ؛ لەوێدەرێ 🇮🇷 ١. اینجا ٢. در اینجا

**هازار** / hazar/: ناو. ١. ☜ **ئازار** ٢. ☜ **هەزار**

**هازە**[1] / haze/: ☜ **کاردوو**

**هازە**[2]: دەنگەناو. گیـزە؛ دەنگـی زۆر بـاریکی ئـاوی سەر ئاور ‹هازەی سەماوەر دێت› 🇮🇷 وز- وز

**هازەپەلک** / hazepel(i)k/: نـاو. جۆرێ کـاردوو 🇮🇷 نوعی گیاه

**هازەخوگانە** / hazexûgane/: ناو. جـۆرێ کـاردوو 🇮🇷 نوعی گیاه

**هازەڕەشە** / hazeřeşe/: ناو. جۆرێ کاردوو 🇮🇷 نوعی گیاه

**هازەکوڕانە** / hazekuřane/: ناو. جۆرێ کـاردوو 🇮🇷 نوعی گیاه

**هازەکوڕە** / hazekuře/: ناو. جۆرێ کاردوو 🇮🇷 نوعی گیاه

**هازەمارانە** / hazemarane/: نـاو. جۆرێ کاردوو 🇮🇷 نوعی گیاه

**هازی** / hazî/: ☜ **هاز ـ٣**

**هاژ** / haj/: ناو. گێژ؛ سەرسام 🇮🇷 هاج و واج

**هـاژان** / hajan/: چـاوگ. ١. هـاتوچـۆ کـردنی خێرای ئاو یان با بە شوێنێکدا ‹هەر مەوجی هـەوا بوو لـە شـەقەی باڵـی دەهـاژان/ هـەر لـەو دەمـەوە بەرزەفڕی چۆ سەفی واژان «حـەقیقی»› ٢. بـەرز و نـەوی بوونـەوەی خێـرا (وەک: سـنگ لـە کـاتی هەناسەبڕکێدا) 🇮🇷 ١. عبور کردن سریع آب یـا بـاد از جایی ٢. پایین و بالا کردن

**هاژوکاژ** / haj û kaj/: ئاوەڵناو. گێج و وڕ 🇮🇷 گـیج و منگ

**هاژوواژ** / haj û waj/: ☜ **هاجوواج**

**هاژۆ**[1] / hajo/: ناو. ئاژۆ؛ ئاژوەر؛ شۆفێر 🇮🇷 راننده

**ـ هاژۆ**[2]: ☜ **ـ ئاژۆ**

**هـاژۆت** / hajot/: نـاو. پـەلامار؛ وروژم؛ ورووژم 🇮🇷 هُجوم؛ یورش

**هاژۆتانـدن** / hajotandin/: چـاوگ. ١. لێخـوڕین؛ بەڕێگاوە بردن ٢. هەڵخڕاندن؛ دنەدان 🇮🇷 ١. راندن ٢. تحریک کردن

**هاژۆتکـار** / hajotkar/: ئاوەڵـناو. هاژۆتیـار؛ پەلاماردەر؛ ورووژمکەر 🇮🇷 مُهاجم

**هاژۆتن / hajotin/**: چاوگ. ١. لێخوڕین؛ ئاژۆتن ‹ئێسترەکانی هاژۆت› ٢. پەلامار دان؛ هەڵمەت بردن ١. راندن ٢. یورش بُردن

**هاژۆتی / hajotî/**: ناوەڵناو. لێخوڕدراو؛ ئاژواو؛ بەڕێگاوە براو هدایت شده (توسط رانده)

**هاژۆتیار / hajotyar/**: ☜ **هاژۆتکار**

**هاژۆر / hajor/**: ناو. لێخوڕ؛ بەڕێگاوەبەر رانده

**هاژە / haje/**: دەنگەناو. هاشە: ١. دەنگی بای بەتەوژم ٢. دەنگی ئاوهەڵدێر ٣. دەنگی ئاوی بەتەوژم ‹نە گرمەی هەور و هاژەی ڕێژنەباران/ نە سروەی با و شنەی سوورەچناران «هێمن»› ١. صدای تُندباد ٢. صدای آبشار ٣. صدای آب خروشان

▣ **هاژە کردن**: هاڕە کردن؛ داڕووخانی شتی گەورە و قورس (وەک: بەرد و شاخ) ریزش کردن

**هاژە هێنان**: بە لادا هاتن و دارانەوەی شتی گەورە و قورس ‹بەجێ ماوم لەگەڵ مـن، حەسرەتا، مەکسم لە سەر بایەک/ بە جارێ هاژە بێنم مەحویا وەک دارەکەی سەرکەل «مەحوی»› افتادن شیء بزرگ و سنگین

**هاژەک / hajek/**: ناو. فیشەکەشێتە فشفشه

**هاژیان / hajyan/**: ☜ **هاژین**

**هاژین / hajîn/**: چاوگ. هاژیان؛ هاژان؛ ١. هاتوچۆ کردنی خێرای ئاو یان با بە شوێنێکدا ٢. بەرز و نەوی بوونەوە (وەک: سنگ لە کاتی هەناسەبڕکێدا) ١. عبور کردن سریع آب یا باد از جایی ٢. نوسان کردن

**هاژێلە / hajêle/**: ناو. کووژەکە نوعی خرمُهره

**هاس / has/**: ناو. ١. ☜ **کاردو** ٢. یۆز؛ وێز؛ دوڕشێر؛ تاژپڵنگ ٣. خواز؛ خواست ٤. ترس؛ باک ٥. هەست؛ شەس؛ هۆشە؛ ڕەوتی حەسان ١. ☜ **کاردو** ٢. یوزپلنگ ٣. خواست؛ اراده ٤. ترس و بیم ٥. حس

**هاسان[1] / hasan/**: چاوگ. حەسانەوە آسودن

**هاسان[2]**: ☜ **ئاسان**

**هاسانبژیو / hasanb(i)jîw/**: ناوەڵناو. کەمخەرج کمخرج

**هاسانی / hasanî/**: ناو. سانایی؛ ئاسانی آسانی

**هاسایش / hasayîş/**: چاوگ. چاو پێکەوتن دیدار کردن

**هاست / hast/**: ناوەڵناو. ئاشت؛ هاشت؛ هەڤان؛ نێوانخۆش قهرنکرده

**هاستی / hastî/**: ناو. ئاشتی؛ نێوانخۆشی آشتی

**هاسکەهاسک / haskehask/**: ☜ **هەنکەهەنك**

**هاسل / hasil/**: ناو. ئاکام؛ نەتیجە حاصل

▣ **هاسلی کەلام**: پوختەی وتار خلاصەی کلام

**هاسۆ / haso/**: ☜ **ناسۆ**

**هاسەر / haser/**: ☜ **هەوبەر**

**هاسێ / hasê/**: ناوەڵناو. عاسێ؛ سەخت و دژوار سخت و دشوار

**هاش[1] / haş/**: ناو. ١. ئیشتیا؛ تامەزرۆیی ٢. وچان؛ ڕاوەستانی کورت ٣. تینوەتی زۆر ١. اشتها ٢. توقف کوتاه ٣. عطش

**هاش[2]**: ناوەڵناو. ١. بێنرخ؛ نەتشت؛ بێبەهرە؛ بە هیچێ ٢. ئاشت؛ نێوانخۆش ١. بیارزش ٢. آشتی

**هاشا / haşa/**: ☜ **حاشا**

**هاشاوڵ / haşawił/**: ناو. پەلامار؛ شاڵاو حمله

▣ **هاشاوڵ بردن**: پەلامار دان؛ هێرش بردن ‹کاتێ دینەوە بە گاڵتە کردن/ هاشاوڵ بۆ گوێی یەکتری بردن «قانع»› حمله کردن

**هاشت / haşt/**: ☜ **هاست**

▣ **هاشت کرن**: ڕازی کردن راضی کردن

**هاشرمە / haşirme/**: ناو. یاشرمە؛ هێشرمە؛ کەژوێ کە دەکرێتە پالوو رانکی

**هاشمە / haşme/**: ناو. ١. هەیڤ؛ مانگی ئاسمان

بە پڕی ۲. ئاشمە؛ مانگانە؛ کرێی مانگ بە مانگ ✉ ۱. قُرص ماه ۲. اجارەی ماهیانە

**هاش‌وهوش** / haş û hûş/: ☜ **هاشەوهوشە**

**هاشوشە** / haşûşe/: ☜ **هاوسێ**

**هاشە**[1] / haşe/: ناو. گەف؛ بافیش؛ شات‌وشووت؛ کاری خۆ هەڵکێشان ✉ لاف

**هاشە**[2]: ☜ **هاژە**

**هاشەکەر** / haşekar/: ئاوەڵناو. خۆهەڵکێش؛ بافیشکەر؛ فیشاڵکەر؛ فیشاڵباز؛ بە خۆدا هەڵبێژ ✉ لافزن

**هاشەوپاشە** / haşe w paşe/: ناو. مۆتەکە؛ کامۆس؛ خەونی تێکەوڵێکە و ترسناک ✉ کابوس

**هاشەوهوشە** / haşe w hûşe/: ناو. هاش‌وهووش: ۱. بافیش؛ فیشاڵ؛ شات‌وشووت ۲. هەڕەشە و گوڕەشە ✉ ۱. لاف و گزاف ۲. تهدید گزافه

**هاف**[1] / haf/: ناو. ۱. پانایی سەربان؛ ڕووکاری دەرەوەی سەربان ۲. بالاخانە؛ نهۆمی سەرەوە ✉ ۱. نمای بیرونی بام ۲. طبقەی بالای ساختمان

**هاف**[2]: ئامراز. نک؛ کن؛ جەم؛ لا؛ بال ‹ڕۆژا هەشر، دەما کو ئینسان دەردکەڤە هافا خوەدێ، شەرم دکە› ✉ نزد؛ پیش

**هافڕ** / hafiř/: ناو. ۱. ئاخوڕ؛ ئالفدان ۲. تفاق؛ کا و گیای هەمارکراو ✉ ۱. آخور ۲. علوفەی انبار شده

**هافڕدان** / hafiřdan/: ناو. عەنباری گیا و تفاق ✉ انبار علوفه

**هافل** / hafil/: ناو. ئاکام؛ نەتیجە ✉ نتیجه

**هافنیوم** / hafinyum/: ناو. توخمێکی کیمیاوی کانزاییە، بە ژمارەی ئەتومی ۷۲ و کێشی ئەتومی ۱۷۸,٤۹ کە ئالیاژی لێ‌بەرهەم دێنن ✉ هافنیُم

**هاڤ** ـ / hav-/: پێشگر. هەڤ ـ هاو ـ هەر ئەو بارە؛ وەک ئەو؛ وەک یەک؛ شەریک ‹هاڤماڵ؛ هاڤدەم؛ هاڤڕێ› ✉ هم ـ

**هاڤا** / hava/: ناو. داروو‌کەیەکە بە کونی نیری گایدا دەکەن ✉ قطعه چوبی در یوغ

**هاڤاڵ** / haval/: ☜ **هاواڵ**

**هاڤرسک** / havrisk/: ☜ **هەورس**

**هاڤرۆنگ** / havrong/: ناو. وەرز؛ سەردەم؛ هەڕەت ✉ موسم

**هاڤڕ** / havir/: ناو. ۱. هافڕ؛ ئاخوڕ ۲. ئاوڕ؛ کاری لا کردنەوە ✉ ۱. آخور ۲. التفات

☐ **هاڤڕ فەدان**: ئاوڕ دانەوە؛ لاکردنەوە ✉ واپس نگریستن

**هاڤڕ ڤێدان**: ئاوڕ لێ دانەوە؛ لا لێ کردنەوە ✉ التفات کردن

**هاڤڕک** / havřik/: ئاوەڵناو. ڕکابەر؛ ملەکەر؛ بەربەرەکانێ‌کەر ✉ رقیب

**هاڤڕکێ** / havř(i)kê/: ناو. هاورکانی؛ کێبەرکێ؛ ڕکبەرکێ ✉ رقابت

**هاڤڕێ** / havrê/: ☜ **هاوڕێ**

**هاڤڕێژ** / havřêj/: ئاوەڵناو. زاوێر؛ ڕەحەت (ژن) ✉ ارضاشده (زن)

**هاڤڕێژە** / havřêje/: ناو. ڕەوتی زاوێر بوون؛ ڕەحەت بوون (ژن) ✉ ارضای جنسی (زن)

**هاڤل** / havil/: ناو. ۱. بەهرەی کار؛ بەروبوو ۲. ڕەوتی نەترسان لە کار و مل پێوە نان ۳. کۆشش و تەقالا ٤. ئاریکاری؛ یارمەتی ✉ ۱. بهرەی کار ۲. اقدام ۳. کوشش ۴. یاری

☐ **هاڤل بون**: بەهرە دیتن؛ قازانج کردن ✉ سود بردن

**هاڤل کردن**: بەهرە پێ دان ✉ سود رساندن

**هاڤلیک** / havlîk/: ناو. هاڤلێک: ۱. گیا گەسک ۲. گەسک؛ گزگ ✉ ۱. گیاه جارو ۲. جارو

**هاڤلێک** / havlêk/: ☜ **هاڤلیك**

**هاڤن** / havin/: ☜ **ئاوان**[1]**ـ۱**

**هاڤۆتن** / havotin/: ☜ **هەڤۆتن ـ۲**

**هاڤە** / have/: ئاوەڵکار. لەو لاوە؛ لەو بەرەوە ✉ از

آن‌سو

**هاڤەن / haven/**: ناو. ئامانج؛ مەبەست ☰ هدف

**هاڤەین[١] / haveyn/**: ☜ **هەوێن**

**هاڤەین[٢]**: ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. تۆزقاڵ؛ کەمووسکە ‹هاڤەینێ ترسێ لبا من نینە› ☰ اندک

**هاڤی[١] / havî/**: ناو. پریشکەی باران لە سەر گەڵا و گوڵ ☰ قطرات باران روی برگ

**هاڤی[٢]**: ئاوەڵناو. نامۆ؛ غەوارە ☰ بیگانە

**هاڤیتن / havîtin/**: ☜ **هاویشتن**

**هاڤیتە / havîte/**: ئاوەڵناو. ئاوێژراو؛ فڕێدراو؛ تووڕدراو ☰ پرتاب‌شده

**هاڤیتەر / havîter/**: ناو. فڕێدەر ☰ پرتاب کننده

**هاڤیژی / havîjî/**: ناو. ئێرەیی؛ بەغیلی؛ بەغێڵی ☰ حسادت

**هاڤین / havîn/**: ناو. ١. ☜ **هاوین[٢]** ٢. ☜ **هەوێن**

▣ **هاڤینا پاشین**: مانگی ئاب؛ ئاغستۆس؛ بەرامبەر بە مانگی ئووت، مانگی هەشتەمی زایینی ☰ ماه اوت

**هاڤینا پێشن**: مانگی حوزەیران؛ بەرامبەر بە مانگی جوون، مانگی شەشەمی زایینی ☰ ماه ژوئن

**هاڤینا میرشەرمفد** /مەجاز/ مانگی ڕەزبەر ☰ مهر ماه

**هاڤینا ناڤین**: ١. چلەی هاوین ٢. /کینایە/ گەرمای زۆر ☰ ١. چلّەی تابستان ٢. گرمای شدید

**هاڤینچێن / havînçên/**: ئاوەڵناو. هاوینە؛ لە هاویندا کێڵدراو (شیناوەرد) ☰ تابستانی (کشت)

**هاڤینڤان / havînvan/**: ناو. کوێستانچی ☰ ییلاق‌رو

**هاڤینڤانی / havînvanî/**: ناو. کاری چوونە هەوار ☰ عمل به ییلاق رفتن

**هاڤینگە / havînge/**: ☜ **هەوار_٢**

**هاڤینۆک / havînok/**: ناو. ڕۆژانی گەرمی بەهار کە ئاژەڵ تێر دەخوا ☰ روزهای گرم بهار

**هاڤینەچەڕ / havîneçeř/**: ناو. لەوەڕگەی پووش و پار ☰ مرتع تابستانی

**هاڤینەسەر / havîneser/**: ناو. جلکی هاوینە؛ پۆشاکی تاوسانی ☰ پوشاک تابستانی

**هاڤینەوار / havînewar/**: ☜ **هەوار_٢**

**هاڤینەهەوار / havînehewar/**: ☜ **هەوار_٢**

**هاڤینی / havînî/**: ☜ **هاوینی**

**هاڤێن / havên/**: ☜ **هەوێن**

**هاقو / haqû/**: ناو. جۆرێ کۆتر کە دەنی «هاقوو» دەردێنێ ‹کەوی دەنووک سوور، کۆتری هاقوو/ قیژەی قژاکە قژقژی پەپوو «قانع»› ☰ نوعی کبوتر

**هاقە / haqe/**: ناو. مز؛ مزە؛ ماجوو ☰ مُزد

**هاک / hak/**: ناو. هۆک؛ خا؛ هێلکە ☰ تخم‌مرغ

**هاکا / haka/**: ئاوەڵکار. ١. بەو نزیکانە؛ زۆری نەماوە ‹هاکا هەڵپچڕا ئەم گیر و بەندە/ هەر کەسە عەقلی خۆی لا پەسەندە «پیرەمێرد»› ٢. ئاوا؛ بەم جۆرە؛ بەو تەرزە ☰ ١. نزدیک است ٢. چنین

**هاکدان / hakdan/**: ☜ **هێکدان**

**هاکۆ / hako/**: ئاوەڵکار. ١. نشتگاف؛ لەپڕ ٢. نەدیتە؛ نەدیو؛ بێ چاو پێ کەوتن ٣. بە گوترە؛ بێ پێوان ☰ ١. ناگهان ٢. ندید ٣. تخمینی

**هاگ / hag/**: ناو. هاگە؛ هێگ؛ خا؛ هیلکە؛ هێلکە ☰ تخم پرنده

**هاگا / haga/**: ☜ **ئاگا**

**هاگادار / hagadar/**: ☜ **هاگیدار**

**هاگۆس / hagos/**: ناو. ١. تەختەزەوی خەت دراو بۆ ڕۆژە جووت ٢. هۆگان؛ خەتی جووت لەم سەر تا ئەو سەر ☰ ١. قطعه زمین ویژەی شخم یک روز ٢. طول شیار شُخم

**هاگە / hage/**: ☜ **هاگ**

**هاگەبان / hageban/**: ناو. هاگەوان؛ هێلیڤان؛

هێلیڤانک؛ ڕاوکە؛ ماڕکە ☰ فال

**هاگەوان / hagewan/**: ☜ **هاگەبان**

**هاگی / hagî/**: ناو. هەواڵ؛ خەوەر؛ خەبەر؛ دەنگوباس ☰ خبر

**هاگیدار / hagîdar/**: ئاوەڵناو. هاگادار: ١. وریا؛ وشیار ٢. لە سەر هەست ☰ ١. هوشیار ٢. گوش‌بەزنگ

**هال / hal/**: ناو. ١. نەمام؛ بنتا؛ چەلاک ٢. درم؛ پەتا؛ ئازار ☰ ١. نهال ٢. بیماری واگیر

⊡ **هال کەتن**: تووشی نەخۆشی وەبا بوون ☰ دچار وبا شدن

**هالان / halan/**: چاوگ. ١. دنەدان؛ هانەدان ٢. قیرە و هەرا و قوولە کردن ☰ ١. برانگیختن ٢. جار و جنجال برپا کردن

**هالمەوت / halmewt/**: ☜ **هەلامەت**

**هالوا / halwa/**: ☜ **هالو**

**هالوە / halwe/**: ناو. گۆزک؛ گۆزە ☰ کوزە

**هالۆ / halo/**: ئاوەڵکار. ئاوا؛ ئاوها؛ ولۆ ☰ چنین

**هالۆق / haloq/**: ناو. هێلۆق؛ بای بۆڕ؛ هەول؛ نەخۆشییەکە تووشی ئەندامانی شەرم دێ ☰ سفلیس

**هالو / halû/**: ناو. لالۆ؛ خاڵ؛ هالوا؛ برای دایک ☰ دایی

**هالوزا / halûza/**: ناو. خاڵۆزا؛ کچ یان کوڕی خاڵ ☰ دختر/ پسردایی

**هالە / hale/**: ناو. میمک؛ خوشکی دایک ☰ خالە

**هالەت / halet/**: ناو. ١. چۆنەتی؛ چۆنیەتی ٢. ئامراز؛ کەرستە ٣. گاسن؛ گاوەسن ☰ ١. حالت ٢. ابزار ٣. گاوآهن

**هالەزا / haleza/**: ناو. میمکەزا؛ میمکزا ☰ دختر/ پسرخالە

**هالەین / haleyn/**: ☜ **هێلانە**

**هالیر / halîr/**: ناو. دۆ؛ دەو ☰ دوغ

**هالێن / halên/**: ناو. ١. ☜ **هێلانە** ٢. دەیدک؛ جۆلانەی منالانی ساوا ☰ ١. ☜ **هێلانە** ٢. ننو

**هاڵ[١] / hał/**: ناو. ١. *[باوەڕی کۆن]* ئاڵ؛ جنۆکەی زەیستان‌کوژ ٢. بەرزایی کێو کە بۆ خوار ڕوانینی سەرەگێژە دێنێ ٣. بەردەڕێژگە؛ تراویلکە ٤. ئاغەڵی مەڕ ٥. ئەشکەفت؛ ئەشکەوت ٦. ڕەنگی ئاڵ؛ سووری کاڵ ٧. حاڵ؛ بار؛ چۆنیەتی شتێ یان بارودۆخی کەسێ «ئەوسە مەزانی دڵ جەفاش کێشان/ هاڵ داد ئاخ بپەرسی جێشان «بێسارانی»» ٨. قۆرە؛ بەرسیلە ٩. هۆڵ؛ هۆڵ؛ دیوێ کە دەرگای ماڵی بە سەردا دەکرێتەوە و لەوێوە بۆ دیوەکانی تر دەچن ☰ ١. آل ٢. بُلندای کوە ٣. سراب ۴. آغُل احشام ۵. غار ۶. سُرخ روشن ۷. حال ۸. غورە ۹. هال

⊡ **هاڵ بردنەوە**: *[باوەڕی کۆن]* بێهۆش بوونی زەیستان لە دەست جنۆکە ☰ بیهوش شدن زائو از ترس آل

**هاڵ[٢]**: ئاوەڵناو. ١. ئاڵ؛ کولبوو لە ترشی (ددان) ٢. بە ڕەنگی ئاڵ؛ سوورکاڵ ٣. کاڵ؛ ڕەنگ‌نەماو ☰ ١. کُند شدە از تُرشی (دندان) ٢. بە رنگ سرخ روشن ٣. رنگ‌باختە

⊡ **هاڵ بونەوە**: هاڵەو بوون؛ ئاڵ بوونەوە؛ کول بوونی ددان لە ترشی خواردن ☰ کُند شدن دندان از تُرشی

**هاڵەو بون**: ١. ☜ **هاڵ بونەوە** ٢. ئۆقرە گرتن. هەروەها: **هاڵەو کردن** ☰ ١. ☜ **هاڵ بونەوە** ٢. آرام گرفتن

**هاڵا / hała/**: ناو. ١. ☜ **هاواڵ** ٢. پەناگە؛ دالدە ٣. هاگا؛ خەبەر؛ ئاگا ٤. داد و فەریاد ☰ ١. ☜ **هاواڵ** ٢. پناهگاه ٣. اطلاع؛ خبر ۴. داد و فغان

**هاڵاش / hałaş/**: ☜ **هەڵاش**

**هاڵان / hałan/**: چاوگ. ئالان؛ پێچان؛ پێچیان ☰ پیچیدن

**هاڵاندن / hałandin/**: چاوگ. ئالاندن؛پێچانن؛ پێچاندن؛ لوول دان ‹ڕایمووسی لێوی شیرن‌تر لە قەند/ لە دەستی هالاند کەزی وەک کەمەند «هێمن»› ☰ پیچاندن

**هاڵاو / haław/**: ناو. هەلاو؛ هەلاو: ١. تینی گەرمای زۆر بە تەوژم ٢. بۆق لە بەر گەرما ٣. گۆشتاوی بە هالە ‹ئەگەر ئاوگۆشتە، بینە ئەو دەشتە! ئەگەر هالاوە بینە ئەم لاوە! «مەسەل»› ☰ ١. هُرم گرما ٢. بُخار ٣. آبگوشت با غوره

**هاڵوبلاڵوک / hałub(i)łałûk/**: ☜ بلاڵوک

**هاڵوبەلاڵوک / hałubełałûk/**: ☜ بلاڵوک

**هاڵوهەواڵ / hał û hewał/**: ناو. دەنگ و باس ☰ خبر

**هاڵوێن / hałwên/**: ناو. کار و ڕەوتی خۆش کردنی خیگە بە دەرمانات ☰ عمل دباغ دادن خیگ

**هاڵۆ / hało/**: ناو. دیزە؛ دەفری گلینی شێو تێدا لێنان ☰ دیزی

**هاڵۆبەلاڵوک / hałobełałûk/**: ☜ بلاڵوک

**هاڵۆز / hałoz/**: ☜ ناڵۆز

▣ **هاڵۆز بون**: ☜ ناڵۆزان

**هاڵۆزان / hałozan/**: ☜ ناڵۆزان

**هاڵۆزاو / hałozaw/**: ☜ ناڵۆزاو

**هاڵۆزکان / hałozkan/**: ☜ ناڵۆزان

**هاڵۆزکاو / hałozkaw/**: ☜ ناڵۆزاو

**هاڵۆسکان / hałoskan/**: ☜ ناڵۆزان

**هاڵۆسکاو / hałoskaw/**: ☜ ناڵۆزاو

**هاڵو / hałû/**: ☜ ناڵو ـ١

**هاڵوبلاڵوک / hałûb(i)łałûk/**: ☜ بلاڵوک

**هاڵە / hałe/**: ناو. ١. بەرسیلە؛ هال ‹هالە بە هەنگوورا ئەروانێ ئاو ئەگرێ «مەسەل»› ٢. جۆرێ کوانی سپی‌واش ٣. مالە؛ ئالە؛ پەڵەی دەم و چاوی ژنی دووگیان ☰ ١. غوره ٢. نوعی دُمل ٣. لک حاملگی

**هاڵەبەلاڵوک / hałebełałûk/**: ☜ بلاڵوک

**هاڵەپرووز / hałep(i)řûz/**: ناو. ڕەوتی پرووزان؛ پرووزیان (وەک: موو بە ئاور) ☰ پخس

▣ **هاڵەپرووز بون**: پرووزان ☰ پخسیدن

**هاڵەژێر / hałejêr/**: ☜ هاڵەژێڵ

**هاڵەژێڵ / hałejêł/**: ناو. هالەژێر؛ خونچەی تازە هەڵپێچراوی دار مێو ☰ شکوفەی تازە دمیدەی درخت مو

**هاڵەژێڵە / hałejêłe/**: ناو. قۆرە؛ بەرسیلە؛ پەسیرە ☰ غورە

**هاڵەکۆک / hałekok/**: ☜ ناڵەکۆک

**هاڵەمارانە / hałemarane/**: ناو. پەسیرەمارانە؛ بەرسیلەمارانە؛ قۆرەمارانە ☰ نوعی غورە

**هاڵی / hałî/**: ئاوەڵناو. ١. حالی؛ تێگەیشتوو ٢. خالی؛ بەتاڵ؛ والا ☰ ١. حالی؛ متوجە ٢. خالی

**هاڵیگا / hałîga/**: ناو. خالیگە؛ برک؛ کەلەکە ☰ تُهیگاه

**هاڵی‌وهەواڵە / hałî w hewałe/**: ئاوەڵناو. خالی و پەتی؛ خالی؛ وال ‹هال بەدهال بەدەن هالی‌وهەوالە/ یانێ های چوون سەنگ قولەی قەزالە «مەولەوی»› ☰ خالی

**هاڵێ / hałê/**: ناو. ١. هالە؛ هال؛ بەرسیلە؛ قۆرە ٢. ترێ؛ هەنگوور ☰ ١. غورە ٢. انگور

**هام ـ / -ham/**: پێشوشە. هاوـ ‹هامدەرد؛ هامسا؛ هامفەرد› ☰ هم ـ

**هاما / hama/**: ئاوەڵکار. ١. لەو دەمەدا ٢. هاتو؛ گریمان ☰ ١. آن هنگام ٢. فرضاً

**هاماج / hamac/**: ناو. بەین؛ نابین؛ نێوان ☰ میان

**هامار / hamar/**: ئاوەڵناو. هومار؛ گۆڕ؛ ڕاست و تەخت ☰ هموار

**هاماری / hamarî/**: ناو. گۆڕایی؛ جێگەی تەختی بێ کەند و کلۆ ☰ زمین هموار

**هامال‌** / hamał/: ناو. هاوملە؛ هاوکێشە ☰ حریف

**هامبار** / hambar/: ☜ **هەمار**

**هامبەش** / hambeş/: ناوەڵناو. بەشدار؛ خاوەن‌بەش ☰ سهیم

**هامبێز** / hambêz/: ☜ **هامێز**

**هامپا** / hampa/: ناوەڵناو. ئامپا: ١. هاوپیشە؛ هاوپلە لە کاردا ٢. *[کینایە]* بەدەوڵەت و دارا (جووت‌بەندە) ☰ ١. همپایه ٢. دارا (کشاورز)

**هام‌پیاڵە** / hamp(i)yałe/: ☜ **هاوپیاڵە**

**هامتا** / hamta/: ☜ **هاوتا**

**هامتایی** / hamtayî/: ناو. وەک‌یەکی ☰ مُشابهت

**هامتەراز** / hamteraz/: ☜ **هاوتەراز**

**هامتەرازوو** / hamterazû/: ☜ **هاوتەرازوو**

**هامجووت** / hamcût/: ☜ **هاوسەر**[1]**ـ١**

**هامدەرد** / hamderd/: ☜ **هاودەرد**

**هامدەم** / hamdem/: ☜ **هاودەم**

**هامراز** / hamraz/: ناو. هەمراز؛ ئامراز؛ ئامێر ☰ ابزار

**هامڕا**[1] / hamřa/: ☜ **هاوڕێ**

**هامڕا**[2]: ☜ **هاوڕا**[2]

**هامڕاز** / hamřaz/: ☜ **هاوڕاز**

**هامڕایی** / hamřayî/: ناو. ١. ☜ **هاوڕێیی** ٢. شەریکی لە بیر و ڕادا ☰ ١. ☜ **هاوڕێیی** ٢. همرأیی

**هامڕیش** / hamřîş/: ☜ **هاوڕیش**

**هامزا** / hamza/: ناوەڵناو. دوانە؛ ئاواڵ دوانە؛ جمک؛ جوی؛ لفەودوانە ☰ همزاد

**هامزوان** / hamz(i)wan/: ☜ **هاوزمان**

**هامسا** / hamsa/: ☜ **هاوسێ**

**هامساڵ** / hamsał/: ☜ **هاوساڵ**

**هامسایی** / hamsayî/: ☜ **هاوسێتی**

**هامسنوور** / hams(i)nûr/: ☜ **هاوسنوور**

**هامسەر** / hamser/: ☜ **هاوسەر**[1]

**هامسەفەر** / hamsefer/: ☜ **هاوسەفەر**[1]

**هامسەنگەر** / hamsenger/: ☜ **هاوسەنگەر**

**هامشاری** / hamşarî/: ☜ **هاوشاری**[2]

**هامشان** / hamşan/: ☜ **هاوشان**

**هامشانی** / hamşanî/: ناو. هاوپایەیی ‹قیبلەم تا سەحەر گوفت‌وگۆشان بێ/ داوای هامشانی زولف تۆشان بێ «سەیدی»› ☰ همپایگی

**هامشکڵ** / hamş(i)kił/: ☜ **هاوچەشن**

**هامشۆ** / hamşo/: ☜ **هات‌وچۆ**

**هامشوو** / hamşû/: ناو. ژنانی مێردێک ☰ هَوو

**هامشیر** / hamşîr/: ☜ **هاوشیر**

**هامشیرە** / hamşîre/: ☜ **هاوشیرە**

**هامعومر** / ham'umir/: ☜ **هاوساڵ**

**هامفەرد**[1] / hamferd/: ناو. دۆست؛ هەواڵ ‹کۆ سەوزەی ئێمەیچ نە کام هەردێ بۆ؟/ وە فەرش مەجلیس کام هامفەردێ بۆ؟ «مەولەوی»› ☰ دوست

**هامفەرد**[2]: ناوەڵناو. هاودەنگ؛ هاودەم ‹نە چەم جە دیدەی ئازیز بێ‌گەرد/ نە گۆش جە سەدای یاران هامفەرد «مەولەوی»› ☰ همدم

**هامڤەر** / hamver/: ☜ **هاوساڵ**

**هامکاری** / hamkarî/: ☜ **هاوکاری**

**هاملکان** / hamilkan/: ناوەڵناو. ئەمریکایی؛ سەر بە ولاتانی یەکگرتووی ئەمریکا ☰ آمریکایی

**هاممەرز** / hammerz/: ☜ **هاوسنوور**

**هامن** / hamin/: ناو. هاوین؛ تاوسان ‹ڕەوان بی شاهی خۆر پەی تەختی میزان/ سپای هامن جە شامش بی گوریزان «سەیدی»› ☰ تابستان

**هاموشۆ** / hamuşo/: ☜ **هات‌وچۆ**

**هامووەڵاتی** / hamwełatî/: ☜ **هاوشاری**

**هامووەڵایەتی** / hamwełayetî/: ☜ **هاوشاری**

**هامووەوی** / hamwewî/: ناو. هاووەوی؛ هێوەرژن؛ دوو ژنی دوو برا ☰ جاری

**هامۆش** / hamoş/: ناوەڵناو. ئارام؛ هێدی؛ هێمن ☰

آرام

**هاموتا / hamûta/**: ئاوەڵناو. بێسەروشوێن 🇮🇷 ناپدید

**هامەییش / hameyîş/**: چاوگ. هاتن؛ ئامان 🇮🇷 آمدن

**هامیتە / hamîte/**: ئاوەڵناو. ئاوێتە؛ تێکەڵکراو 🇮🇷 آمیخته

**هامین / hamîn/**: ☜ **هاوین**٢

**هامێز / hamêz/**: ناو. هامبێز؛ هەمبز؛ هەمبێز؛ هەمێز؛ هەمبز؛ هەمبێز؛ هەمێز؛ باوەش؛ ئامێز ‹یەکیەکی گرتنە هامێز رووخۆش/ هەورییە هەور و لە رووبا رووپۆش «هەژار، *بۆکوردستان*»› 🇮🇷 آغوش

**هان / han/**: ناو. هانە؛ دنە 🇮🇷 تحریک

⊡ **هان دان**: دنەدان؛ هەڵخڕاندن؛ بەلشاندن 🇮🇷 تحریک کردن

**هانا**١ **/ hana/**: ناو. ١. پەنا؛ کاری لە بەر پاڕانەوە بۆ داد پرسین ‹هانا تۆ خودا هانام ئاوردەن/ ها نام خودام سا پەوکە بەردەن «مەولەوی»› ٢. سۆما؛ سۆ؛ قەوەتی دیتن ‹چاوم هانای نەماوە› 🇮🇷 ١. کمک؛ دادخواهی ٢. سو؛ قدرت دید

⊡ **هانا بردنە بەر کەسێ**: ☜ **هانا بۆ کەسێ بردن**

**هانا بۆ کەسێ بردن**: هانا بردنە بەر کەسێ؛ پەنا بردن بە کەسێ بۆ فریارەسی ‹هانام برد بۆ هەرکەسێ، ئاوڕیشی لێم نەداوە› 🇮🇷 پناه بردن به کسی برای فریادرسی

**هانا بە کەسێکەوە بوون**: پشتئەستوور/ دڵگەرم بوون بە کەسێ ‹هانام بە تۆیە خوای ژیان و ژین!/ لەم دەرفەتەدا شپرزە نەبین «پیرەمێرد»› 🇮🇷 پُشتگرم بودن به کسی

**بە هانای کەسێکەوە هاتن/ چوون**: ☜ **هاتنە هانای کەسێك**

**هاتنە هانای کەسێکەوە**: بە هانای کەسێکەوە هاتن؛ گەیشتنە فریای کەسێ ‹کوا قەرە تاژدین؟ چەکۆ و عرفۆ لە کوێن؟/ بێنە هانام وەک پڵینگی چنگبەخوێن «هێمن»› 🇮🇷 به فریاد کسی رسیدن

**هانا**٢: ئاوەڵکار. ئەو جۆرە؛ ئاوها ‹بۆ شتێکی بێبایەخ، هانا نابێ تووڕە بی و هەڵچی!› 🇮🇷 این‌طور

**هانا**٣: ئامراز. فەرموو؛ چاو؛ بڕوا ‹هانا، یەیش ئازادییەکەت!› 🇮🇷 بفرما؛ بیا و ببین

**هانابەری / hanaberî/**: ناو. دادخوازی؛ دادخوایی 🇮🇷 دادخواهی

**هانا و بانا / hana w bana/**: ئاوەڵناو. دیار و نادیار 🇮🇷 آشکار و نهان

**هانجی / hancî/**: ئاوەڵکار. دیسان؛ دووبارە 🇮🇷 دوباره

**هاند / hand/**: ☜ **هێند**

**هاندۆ / hando/**: ☜ **هاندێ**

**هاندەر / hander/**: ئاوەڵناو. هانەدەر؛ دنەدەر؛ فێتکار؛ هێڤۆژە 🇮🇷 مُحرک

**هاندێ / handê/**: ئاوەڵکار. هاندۆ؛ هێند؛ ئەوەندە؛ هێما بۆ ئەندازە 🇮🇷 مقدار؛ اندازه

**هانقار / hanqar/**: ☜ **هانقاس**

**هانقاس / hanqas/**: ناو. هانقار؛ هانقەراس؛ ئاقار؛ دەور و بەری ئاوەدانی 🇮🇷 حومه

**هانقەراس / hanqeras/**: ☜ **هانقاس**

**هانکە / hanke/**: ☜ **هەنکە**

**هانکەهانک / hankehank/**: ☜ **هەنکەهەنك**

**هانگ / hanig/**: ناو. بەزم و ئاهەنگ 🇮🇷 بزم و سرور

**هانوهوون / han û hûn/**: ناو. کاری پاشگوێ خستن؛ وە دوا خستنی کار بە قەستی. هەروەها: **هانوهوون کردن** 🇮🇷 عمل پُشت گوش انداختن

**هانە / hane/**: ناو. ١. کانی؛ سەرچاوە ٢. دنە؛ هان ٣. ئەنگێزە؛ دنەی دەروونی مرۆڤ ٤. هانکە؛ هەنکە؛ هەسکە 🇮🇷 ١. چشمه ٢. تحریک ٣. انگیزه

۴. هِنوهِن

⊡ **هانە دان:** هان‌دان؛ دنە دان ▬ تحریک کردن

**هانــەدراو / haned(i)raw/:** ئاوەڵــناو. پفــــدراو؛ دنەدراو ▬ تحریک شده

**هانەدرۆزنە / haned(i)roz(i)ne/:** ناو. کوێرەکانی؛ کانییەک کە هاوینــان وشــک دەکــا ▬ چشــمەی فصلی

**هانەدەر / haneder/:** ☜ **هاندەر**

**هانەرەنگینە / hanerengîne/:** ناو. کۆلــەکەزێرینە؛ کۆلــەکەرەنگینە؛ پەلکەزێرینــە؛ کەسکاســۆر ▬ رنگین‌کمان

**هانەگەرمــەڵــە / hanegermeɫe/:** نــاو. گــــراو؛ سەرچاوەی ئاوی گــەرم و ســوێر ▬ چشــمەی آب معدنی گازدار

**هانــەهان / hanehan/:** نـاو. حاڵــەتی شــەکەتی و هەناسە سوار بوون ‹بــە نووکــەنووکی بێــوەژن/ بــە هانەهانــی ماندوان «هــێمن»› ▬ هِــنهِــن ناشــی از خستگی

**هانەهانە / hanehane/:** ناو. ١. دنە؛ هان؛ هانە ٢. ☜ **هــەنکــەهــەنــك** ▬ ١. تحریــک ٢. ☜ **هەنکەهەنك**

⊡ **هانەهانە دان:** هــان‌دان؛ دنــەدان ▬ تحریــک کردن

**هانەهانە کردن:** هانکە هانک کردن ▬ هِــنهِــن کردن

**هانی / hanî/:** ئاوەڵکار. ئەوەتا؛ ئەمەسا ▬ اینک

**هانیاگ / hanyag/:** ☜ **هانیاو**

**هانیــان / hanyan/:** چــاوگ. هێنــان؛ هــاوردن ▬ آوردن

**هانیــاو / hanyaw/:** ئاوەڵــناو. هانیــاگ؛ هاوریــاگ؛ ئاوەردە ▬ آورده

**هانیشک / hanîşk/:** ☜ **ئانیشك**

**هانیشکە / hanîşke/:** ناو. ئانیشکە ▬ زانوی لوله

**هانین / hanîn/:** ☜ **هێنان**

**هانینەوە / hanînewe/:** ☜ **هێنانەوە**

**هانێ / hanê/:** کار. ها بگرە؛ ئەوەتا ▬ بگیر

**هاو[١] / haw/:** ناو. حاڵ؛ چلۆنایەتی ▬ چگونگی

**هاو[٢]:** جێناو. ئەو ▬ او

**هاو[٣]:** دەنگەناو. وتەی بانگ لێ کردن لە دوور ‹هــاو مام بایز! هاو!› ▬ های؛ آی

**هاو ـ[٤]:** پێشگر. ئام ـ هام ـ هەڤ؛ هەم؛ هاڤ؛ ئــاو؛ هەو؛ وەک یەک؛ وێنەی یەک؛ بەرانبەر ‹هاوکــار؛ هاوڕێ؛ هاوماڵ› ▬ هم ـ

**هاوئــامێز / haw'amêz/:** ئاوەڵــناو. هاوبــاوەش ▬ هم‌آغوش

**هاوئاوات / haw'awat/:** ☜ **هاودڵ[١]**

**هاوئاوایی / haw'awayî/:** نــاو. قۆتل؛ هاومــاڵ لــە دێدا ▬ هم‌روستایی

**هاوئایین / haw'ayîn/:** ☜ **هاودین**

**هاوا / hawa/:** نــاو. ١. بارودۆخ؛ چلۆنــەتی ٢. هــۆ؛ سەبەب ٣. هەوا؛ کژ ▬ ١. چگونگی ٢. سبب ٣. هوا

**هــاوار[١] / hawar/:** نــاو. ١. بانــگ ڕاهێشــتن بــۆ ئاریکــاری و ڕەهــا بــوون لــە تەنگانــە ‹ناڵەناڵــی فیکری‌یە وا خەڵقی خستە زەلزەلە/ یا نە خۆ حەشری گونەهکارە، وەها هاوارییە؟ «فیکری کوردستانی»› ٢. قاو؛ دەنگی بڵند ‹منیش لــە ئەلحــەد ســەرم درارم/ داد بکەم هاوار، کەفــەن کــی ســینی؟ «شــامی»› ٣. داد؛ گازندە؛ شکات ‹گوتم: هەی داد و هەی هــاوار/ هــەی لــە ڕێگــای پــەروەردگار «مــەلا ئــاوارە»› ٤. مخــابن؛ ئــاخ و داخ ‹هــاوار ئــەم خەڵــکە چــی لــێ قــەوماوە؟/ ئیختیــار مــاڵ و خــەیزان نــەماوە! «مــەلا حەسەنی دزلی»› ٥. هانا؛ پەنا ‹یا عەوداڵ! سەیدی هــاوار وە تۆشــەن/ دیــدەش بــە دیــدار یــار، کــەری ڕەوشەن «سەیدی»› ▬ ١و٢. فریاد ٣. دادخــواهی ۴. دریغ ۵. پناه

⊡ **هاوار بردنە بەر:** ☜ **هاوار بۆ بردن**

**هاوار بۆ بردن:** هاوار بردنە بەر؛ هاوار بۆ هێنان؛ هانا بردنە بەر؛ پەنا بۆ هێنان ‹دەبێ بخولێتەوە کێو و تەلان و بەندەن و نیسار/ هەتا پەیدا بکا نان و نەبا بۆ خەڵکی شار هاوار «هێمن»› ☗ پناه بردن

**هاوار بۆ هەستان:** ئاریکاری کردنی گشتی بۆ یارمەتی و نەجاتی کەس یان کەسانێ ☗ بسیج شدن همگانی برای کمک و نجات کسی یا گروهی

**هاوار بۆ هێنان:** ☜ **هاوار بۆ بردن**

**هاوار کردن:** هاوار کرن: ١. دەنگ بڵند کردن بۆ ئاریکاری ٢. قیژاندن لە بەر ئێش و ناڕەحەتی ‹هاواری کرد نەیلاوانەوە/ دڵی ئینسانی ئەتاوانەوە «گۆران»› ☗ ١. فریاد برآوردن برای کمک ٢. فریاد کشیدن از شدت درد

**هاوار کرن:** ☜ **هاوار کردن**

**هاوار هەستان:** لێقەومانی گشتی ☗ فاجعەی عمومی روی دادن

**هاواری کەسێ بەرزەوە بوون:** دەرهاتنی دەنگی کەسێک بە بەرزی لە بەر ئێش و ئازار یان زوڵم و زۆر ☗ داد کسی بلند شدن

**بە هاواری کەسێک(ـەوە) هاتن/ چوون:** فریای کەسێ کەوتن ☗ به داد کسی رسیدن

**هاوار**[٢]: دەنگ. ئۆی؛ هەی داد ‹هاوار بە ماڵم!› ☗ وای

**هاواربەرە** / hawarbere/: ناو. کوڕکوڕە ☗ کوکر

**هاواربەماڵم** / hawar be małim/: نزا. حەیف و مخابن؛ داخ و عەزرەت ☗ وایِ من

**هاوارکرۆخ** / hawark(i)rox/: ☜ **هاوارکەر**

**هاوارکەر** / hawarker/: ئاوەڵناو. هاوارکرۆخ؛ زیڕەکەر؛ خودانی بانگ و هاوار ☗ فریاد کُننده

**هاواروهەڵا** / hawar û heła/: ☜ **دادوبێداد**

**هاواڵ** / hawał/: ناو. ئاواڵ؛ ئاوەڵ؛ هاڤاڵ؛ هاڵا؛ هاوەڵ؛ هەڤاڵ؛ هەڤاڵ؛ ☗ رفیق

**هاواڵدوانە** / hawałd(i)wane/: ئاوەڵناو. ئاواڵدوانە؛ جمک؛ جوی؛ لفەدوانە ☗ همزاد

**هاواڵدەرس** / hawałders/: ناو. ئاواڵدەرس؛ ئامدەرس؛ دوو کەس کە پێکەوە دەخوێنن یان خوێندوویانە ☗ همکلاسی

**هاواڵزاوا** / hawałzawa/: ☜ **ئاوەڵزاوا**

**هاواڵکراس** / hawałk(i)ras/: ☜ **ئاوەڵکراس**

**هاواڵەتی** / hawałetî/: ناو. ڕەفیقایەتی؛ دۆستی؛ دۆستایەتی ☗ رفاقت

**هاوان** / hawan/: ناو. ١. ☜ **ئاوان ـ١** ٢. جۆرێ تۆپی شەڕ ٣. خوناو؛ ئاونگ؛ شەونم ☗ ١. ☜ **ئاوان ـ١** ٢. نوعی توپ جنگی ٣. شبنم

**هاوانتە**[١] / hawante/: ناو. فێڵ؛ گزی ☗ نیرنگ

**هاوانتە**[٢]: ئاوەڵناو. ئاوانتە؛ بەلاش؛ مفتە ☗ مُفت

**هاوانتەچی** / hawanteçî/: ئاوەڵناو. هەوانتەچی؛ فێڵباز؛ دەسبڕ ☗ ناروزن

**هاوانتەخۆر** / hawantexor/: ئاوەڵناو. لامژ؛ بەلاشخۆر؛ مفتەخۆر ☗ مُفتخور

**هاوباز** / hawbaz/: ناو. منالدان؛ پزدان ☗ زهدان

**هاوبازوو** / hawbazû/: ناو. *[مەجاز]* ڕەفیق؛ ئاریکاری یەکتر ☗ رفیق

**هاوبازی** / hawbazî/: ☜ **هاوکایە**

**هاوباڵ** / hawbał/: ئاوەڵناو. یاریدەر؛ ئامیار؛ ئاریکار ☗ یاور

**هاوباوەش** / hawbaweş/: ☜ **هاوئامێز**

**هاوبایە** / hawbaye/: ☜ **هاوکاسە**

**هاوبووک** / hawbûk/: ناو. هاووەوو؛ هاووەوی: ١. دوو خوشکی بووکی ماڵێک ٢. دوو ژنی بووکی ماڵێک ☗ ١. دو خواهرِ عروس یک خانواده ٢. جاری

**هاوبەر** / hawber/: ئاوەڵناو. ١. بەرانبەر؛ بەرامبەر؛ هەمبەر ٢. لە پانتاییدا وەک یەک ☗ ١. برابر ٢. هم‌عرض

**هاوبەرە** / hawbere/: ئاوەڵناو. هاوپەڕە؛ لە یەک

بەرە 🇮🇷 همنسل

**هاوبەش** / hawbeş/: ئاوەڵناو. شەریک ‹هاوهەنگاو لە ڕێی خەباتا/ هاوبەش لە هات و نەهاتا «هەژار، *بۆ کوردستان*»› 🇮🇷 شریک

**هاوبەشگە** / hawbeşge/: ناو. بەشدارگە؛ بەشگە 🇮🇷 شرکت

**هاوبەشی** / hawbeşî/: ناو. ١. شەریکایەتی؛ کار و ڕەوتی هاوبەش بوون ٢. دۆخی وەک یەک بوونی دوو یا چەن شت یا کەس لە خاڵ یا بابەتێکدا ‹خاڵی هاوبەشی› * هەروەها: **هاوبەشی کردن** 🇮🇷 ١. شراکت؛ شرکت ٢. اشتراک

**هاوبیچم**[1] / hawbîçim/: ناو. هەڤدەنگ؛ چەند واتای لێک جیا لە یەک وشەدا 🇮🇷 چند معنی مختلف یک کلمه

**هاوبیچم**[2]: ئاوەڵناو. هاوشێوە؛ هاوشکڵ؛ هاودیم 🇮🇷 همشکل

**هاوبیر** / hawbîr/: ☜ **هاوڕا**[2]

**هاوپا** / hawpa/: ئاوەڵناو. ئامپا: ١. هاوشان؛ هاوماڵ؛ وەک یەک لە کار و پیشەدا ٢. هاوڕێ؛ لە ڕێگەدا پێکەوە 🇮🇷 ١. همپایه ٢. همپا

**هاوپاژ** / hawpaj/: ناو. هەڤبەش؛ هاوپشک؛ هاوبەش 🇮🇷 سهیم

**هاوپایە** / hawpaye/: ئاوەڵناو. بەڤڵ؛ هاوشان 🇮🇷 همپایه

**هاوپایەیی** / hawpayeyî/: ناو. هاوشانی؛ دۆخ و چۆنیەتی هاوپلە بوون 🇮🇷 همپایگی

**هاوپشت** / hawpişt/: ئاوەڵناو. هاوپشتە: ١. سەر بە بەرەی باوکێک ‹خزمی هاوپشت› ٢. لە شوێن یەک ‹دوو منداڵی یەک ماڵ› ‹برای هاوپشت› ٣. سواری یەکسمێ ‹دوو کەس› * هەروەها: **هاوپشتی** 🇮🇷 ١. از یک تیره و طایفه ٢. از پی هم ‹دو فرزند یک خانواده› ٣. سوار بر یک ستور ‹دو نفر›

**هاوپشتە** / hawpişte/: ☜ **هاوپشت**

**هاوپشک** / hawpişk/: ئاوەڵناو. شەریک؛ هاوبەش 🇮🇷 شریک

**هاوپۆل** / hawpol/: ئاوەڵناو. هاودەرس؛ لە یەک ڕادەی خوێندندا 🇮🇷 همدرس

**هاوپەڕە** / hawpeře/: ☜ **هاوبەرە**

**هاوپەیمان** / hawpeyman/: ئاوەڵناو. هەمپەیمان؛ هاوسوێند؛ هاوسۆند؛ هەڤسۆند؛ تایبەتمەندی دوو کەس یان لایەنێ کە بەڵێنی ئاریکاریان بە یەکتر داوە ‹وڵاتانی هاوپەیمان›. هەروەها: **هاوپەیمانی** 🇮🇷 همپیمان

**هاوپیاڵە** / hawp(i)yałe/: ناو. ئامپیاڵە؛ هامپیاڵە؛ هاوقەدەح؛ هەمپیاڵە: ١. کەسانێ کە پێکەوە شەراب دەخۆنەوە ٢. *[کینایە]* دۆستی گیانی 🇮🇷 ١. همپیاله ٢. دوست جانی

**هاوپیشە** / hawpîşe/: ئاوەڵناو. ئامپا؛ هاوپا؛ خاوەن کاری وەک یەک 🇮🇷 همپیشه

**هاوپیشەیی** / hawpîşeyî/: ☜ **هاوکاری ـ١**

**هاوتا** / hawta/: ئاوەڵناو. ئامتا؛ هامتا؛ هەڤتا؛ هەمپا؛ هەمتا؛ هەوتا؛ لنگە ‹لە جوانیدا، لە پاکیدا، نییە هاوتات و نازانم/ فریشتەی ئاسمانی یا نە پەروەردەی پەریزادی؟! «هێمن»› 🇮🇷 همتا

**هاوتاقەت** / hawtaqet/: ☜ **هاودەم**

**هاوتای** / hawtay/: ☜ **حەفتا**[1]

**هاوتایی** / hawtayî/: ☜ **هەفتایی**

**هاوتەحر** / hawteĥr/: ☜ **هاوچەشن**

**هاوتەراز** / hawteraz/: ئاوەڵناو. هامتەراز؛ بەرانبەر 🇮🇷 همتراز

**هاوتەرازوو** / hawterazû/: ئاوەڵناو. هامتەرازوو؛ لە کێشانەدا وەک یەک 🇮🇷 هموزن

**هاوتەرح** / hawterĥ/: ☜ **هاوچەشن**

**هاوتەک** / hawtek/: ئاوەڵناو. ١. لنگە؛ هاوتا ٢. ڕفیق؛ ڕەفێق؛ هاواڵ 🇮🇷 ١. همتا ٢. رفیق

**هاوتەمەن** / hawtemen/: ☜ **هاوساڵ**

**هاوتیره** / hawtîre/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **هاوساڵ** ٢. لە یەک عەشیرەت ▤ ١. ☜ **هاوساڵ** ٢. هم‌عشیره

**هاوتێس** / hawtês/: ☜ **حەڤدە**

**هاوتێسن** / hawtêsin/: ☜ **حەڤدەهەم**

**هاوجسن** / hawcisn/: ئاوەڵناو. ١. هاوتەرح؛ لە یەک بیچم ٢. بەرەی باوکێ؛ لە یەک باب ▤ ١. همگونه ٢. از یک طایفه

**هاوجفت** / hawcift/: ئاوەڵناو. هاوجووت: ١. هاوتەک؛ لنگە ٢. *[کنایە]* ژن و مێرد؛ نێر و مێ ▤ ١. همتا ٢. جُفتِ نر و ماده

**هاوجڵەو** / hawc(i)łew/: ناو. سوارێ کە دەگەڵ ئاغا یان حاکمدا سەفەر دەکا ▤ مُلازم رکاب

**هاوجۆر** / hawcor/: ☜ **هاوچەشن**

**هاوجووت**[1] / hawcût/: ناو. *[کنایە]* هەڤجووت؛ ئاوجووت؛ هاوسەر؛ ژن یان پیاوی حەلال ▤ همسر

**هاوجووت**[2]: ئاوەڵناو. هەڤجووت؛ ئاوجووت: ١. *[کنایە]* هاوجفت؛ ژن‌ومێرد؛ نێرینە و مێوینە ٢. لنگە؛ هاوتەک ٣. هاوخاک؛ تایبەتمەندی دوو جووت‌بەندە کە زەوییەکانیان لە پەنا یەکترە ▤ ١. جُفت (نر و ماده) ٢. همتا ٣. همسایه در زمین کشاورزی (کشاورز)

**هاوجووتی** / hawcûtî/: ناو. دۆخی هاوجووت بوون ▤ همسری

**هاوجەم** / hawcem/: ☜ **هاوسفرە**

**هاوجێ** / hawcê/: ☜ **هاونوێن**

**هاوجێیی** / hawcêyî/: ناو. نزیکی؛ پێوەندی جنسی ▤ مُقاربت

**هاوچاخ** / hawçax/: ☜ **هاوچەرخ**

**هاوچاو** / hawçaw/: ناو. هۆماڵ؛ ململانێ‌کەر؛ کەسێ کە ڕکەبەری دەکا ▤ رقیب

**هاوچڕە** / hawçiře/: ناو. ١. کەسێ کە گۆرانی بۆ گۆرانی‌بێژ دەگێڕێتەوە ٢. دوو کەس کە پێکەوە گۆرانی دەڵێن ▤ ١. همخوان ترانه ٢. دوهمخوان ترانه‌ی دوصدایی

**هاوچەرخ** / hawçerx/: ئاوەڵناو. هاوچاخ؛ هەڤچاخ؛ هەڤسال؛ هەڤبەر؛ هەڤدەم؛ هاوگوێن؛ هاوزەمان؛ هاوبەرە؛ هاومێژ ١. هاوڕۆژگار؛ هاوسەردەم؛ هەڵکەوتوو لە یەک کاتدا ‹شێخ ڕەزا تاڵەبانی هاوچەرخی ناسرەدین شا بوو› ٢. سەر بەم سەردەمە ‹نووسەری هاوچەرخ؛ سەردەمی هاوچەرخ› * هەروەها: **هاوچەرخی** ▤ ١و٢. مُعاصر

**هاوچەشن** / hawçeşn/: ئاوەڵناو. هامشکڵ؛ هاوتەحر؛ هاوتەرح؛ هاوجۆر؛ هاوگوێن؛ وەک یەک ▤ همنوع

**هاوخاک** / hawxak/: ☜ **هاوجووت**[2] ـ٣

**هاوخوان** / hawx(i)wan/: ☜ **هاوسفرە**

**هاوخوشک** / hawxuşk/: ناو. *[مەجاز]* دەستەخوشک؛ دوو ژنی هەواڵ وەک دوو خوشک ▤ دو زن دوست مانند دو خواهر

**هاوخوێن**[1] / hawx(i)wên/: ناو. هاونەتەوە؛ هەموو کەسانی لە یەک تیرە و تایفە ‹لە سەر نیشتمان خۆت بە کوشت بدەی/ هاوخوێنەکانی خۆت ڕزگار بکەی «هێمن»› ▤ هم‌نژاد

**هاوخوێن**[2]: ئاوەڵناو. ١. لە یەک باوک و دایک ٢. هاونەتەوە؛ لە یەک تیرە و تایفە * هەروەها: **هاوخوێنی** ▤ ١. هم‌خون ٢. هم‌نژاد

**هاوخەرج** / hawxerc/: ناو. هەر یەک لە ئەندامانی دەستەیێ کە خەرجیان پێکەوەیە و هەر کەس پشکی خۆی دەدات. هەروەها: **هاوخەرجی** ▤ هم‌خرج

**هاوخەڵ** / hawxeł/: ئاوەڵناو. هاوسەنگەر؛ هاومەتەرێز ▤ هم‌سنگر

**هاودڵ**[1] / hawdił/: ناو. *[مەجاز]* هەڤدل؛ هاوئاوات؛ ئەوانەی دڵیان بۆ یەک دێنێ ‹لەو کۆڕەدا

هاودڵێکی نەبوو› ≅ همدل

**هاودڵ**[٢]: ئاوەڵناو. هەڤدل؛ یەکدڵ؛ بە هەست و وازی دۆستانەوە ‹ئەگەر هاودڵم بای، لە دەردم تێدەگەیشتی›. هەروەها: **هاودڵی** ≅ همدل

**هاودۆز** / hawdoz/: ئاوەڵناو. هاومەبەست؛ لە سەر یەک ڕێباز و بە یەک ئامانجەوە. ≅ هم‌مرام

**هاودەرد** / hawderd/: ئاوەڵناو. هامدەرد؛ هەمدەرد؛ هەڤدەرد؛ بە دەرد، نەخۆشی یان تووشیارییەکی وەک یەکەوە ‹ئەی مانگ من و تۆ هەردوو هاودەردین/ هەردوو گرفتار یەک ئاهی سەردین «بێکەس»›. هەروەها: **هاودەردی** ≅ همدرد

**هاودەرس** / hawders/: ☜ **هاوکلاس**

**هاودەس** / hawdes/: ئاوەڵناو. هاودەست؛ هاوکار لە کارێکی زۆرتر نارەوادا ≅ همدست

**هاودەست** / hawdest/: ☜ **هاودەس**

**هاودەم** / hawdem/: ناو. هامدەم؛ هاوتاقەت؛ هۆمدەم؛ هەڤدەڤ؛ هەڤنشین؛ هەڤدەم؛ هەمدەم؛ ئاودەنگ ‹زیندوو پێویستی بە هاودەم هەیە/ بۆ مردوو مردن هەر ئەفسانەیە «هێمن»› ≅ همدم

**هاودەمی** / hawdemî/: ناو. هامدەمی؛ هاودەنگی؛ بار و دۆخی پێکەوە بوون ‹هەر ساڵێ چەند وەخت سەر هەرد ئێلاخ/ وە بۆی هاودەمیت دەماخ مەکەرد چاخ «؟»› ≅ همدمی

**هاودەنگ** / hawdeng/: ئاوەڵناو. ١. ئاودەنگی؛ خەمڕەوێن ٢. ☜ **هاوڕا**[٢] ≅ ١. همدم؛ انیس ٢. ☜ **هاوڕا**[٢]

**هاودەنگیلە** / hawdengîle/: ☜ **ئاودەنگیلە**

**هاودەورە** / hawdewre/: ☜ **هاوقەتار** ـ١

**هاودیم** / hawdîm/: ☜ **هاوبیچم**[٢]

**هاودین** / hawdîn/: ناو. هاوئایین؛ چەند کەسی شوێنگری ئایینێ ≅ هم‌کیش

**هاوران** / hawran/: ناو. جۆرێ پاڵتاو ≅ نوعی پالتو

**هاورد** / hawird/: ناو. بەرهەمی کشت و کاڵ ≅ فراوردەی کشاورزی

**هاوردن** / hawirdin/: ☜ **هێنان**

**هاوردنەوە** / hawird(i)newe/: ☜ **هێنانەوە**

**هاوردە**[١] / hawirde/: ناو. ئاوەردە؛ ئاوردە؛ هاوردی؛ هاوریاگ؛ لە لاوە هێنراو. بەرانبەر: **هەناردە** ≅ واردات

**هاوردە**[٢]: ئاوەڵناو. ئاوەردە؛ ئاوردە؛ هێنراو؛ هاوردی؛ هاوریاگ ≅ آوردە

**هاوردی** / hawirdî/: ☜ **هاوردە**

**هاورکانی** / hawirkanî/: ☜ **هاڤرکێ**

**هاوریاگ** / hawiryag/: ☜ **هاوردە**

**هاوڕ** / hawiř/: ☜ **ئاوڕ** ـ١

**هاوڕا**[١] / hawřa/: ☜ **هاوڕێ**

**هاوڕا**[٢]: ئاوەڵناو. هامڕا؛ هاوبیر؛ هاودەنگ؛ بە بیر و بۆچوونی وەک یەکەوە ≅ هم‌عقیدە

**هاوڕاز**[١] / hawřaz/: ناو. ئامڕاز؛ هامڕاز؛ هەمڕاز؛ هەوڕاز: ١. ئەوانەی پێکەوە ڕازێکی شاراوەیان هەیە ‹تەرەغە! کێوی لەمێژینەی کورد!/ کۆنە هاوڕازی سەفین و هەڵگورد! «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ٢. ئەوانەی ڕازی خۆیان تەنیا بە یەکتر دەڵێن ‹دەگەڵ پیروو بکا ڕاز و نیازێ/ گەلاوێژی بە هاوڕازی بنازێ «هێمن»›. هەروەها: **هاوڕازی** ≅ ١و٢. همراز

**هاوڕاز**[٢]: ئاوەڵناو. ئامڕاز؛ هامڕاز؛ هەمڕاز؛ هەوڕاز؛ بە ڕاز و نیاز ‹یاری هاوڕاز› ≅ همراز

**هاوڕزن** / hawřizn/: ئاوەڵناو. ڕیزهەڤ؛ هاوڕیز؛ لە یەک ڕیزدا ≅ مُترادف

**هاوڕۆژگار** / hawřojgar/: ☜ **هاوچەرخ** ـ١

**هاوڕوو** / hawřû/: ☜ **ئابڕوو**

**هاوڕەنگ** / hawřeng/: ئاوەڵناو. هەڤڕەنگ؛ هەمڕەنگ؛ بە ڕەنگورووی وەک یەکەوە ≅ همرنگ

**هاوڕەنگی** / hawřengî/: ناو. *[کینایە]* هەڤڕەنگی؛

هەمڕەنگی؛ دۆستایەتی گەرم 🇮🇷 همرنگی

**هاوڕیز** / hawřîz/: ئاوەڵناو. هەڤڕێژ؛ هەڤڕیز؛ تەبا؛ چۆنیەتی یەک گرتنی چەند وشە لە ڕستەدا بە شێوەیەکی ڕێک و لەبار 🇮🇷 همردیف

**هاوڕیش**[1] / hawřîş/: ناو. هامڕیش؛ هەڤڕیش؛ هۆمریش؛ ئاوەڵزاوا؛ هاوزاوا 🇮🇷 باجناغ

**هاوڕیش**[2]: ئاوەڵناو. هامڕیش؛ هۆمریش؛ هەڤڕیش: ١. هاوتەمەن؛ هاوعومر ٢. گێچەڵ تێهاڵاو 🇮🇷 ١. همسن‌وسال ٢. درگیر نزاع

⊡ **هاوڕیش بون**: ١. هاوتەمەن بوون ٢. بە زۆر تووشیاری شەڕ بوون ‹هەر لە خۆوە بێ‌سەبەب هاوڕیشم بوو، بە گژما هات!› 🇮🇷 ١. همسن‌وسال بودن ٢. وارد نزاع شدن

**هاوڕیشم** / hawřîşim/: ☜ هەوریشم

**هاوڕێ**[1] / hawřê/: ناو. هاڤڕێ؛ هامڕا؛ هاوڕا؛ ئامڕا؛ هەڤڕێ؛ هەڤڕێک؛ هەمڕا؛ هەوڕێ: ١. ئاواڵ؛ دۆست ‹پیاو دائەنیشێ و ژنان ئەگەڕێن/ شەرم نامێنێ ژن و پیاو هاوڕێن «پیرەمێرد»› ٢. ڕەفیقی سەفەر ‹ئاغا بە قونداغی تفەنگ ڕایهێشتە هاوڕێکەم، بەر لەوە لێی کەوێ تفەنگم گرت و ڕامتڵەکاند و بە دەستمەوە هات! «هەژار، چێشتی مجێور»› ٣. شوێنگر؛ پێڕەو ‹ئەو کاتە کە هەردوو کۆمەڵ یەکتریان دی، هاوڕێیانی مووسا گوتیان: پیس پێوە بووین! «هەژار، *قورئان*»› ٤. ئاگاداری نەخۆش 🇮🇷 ١. دوست ٢. همسفر ٣. پیرو ۴. همراه بیمار

**هاوڕێ**[2]: ئاوەڵناو. هاڤڕێ؛ هامڕا؛ هاوڕا؛ ئامڕا؛ هەڤڕێ؛ هەڤڕێک؛ هەمڕا؛ هەوڕێ: ١. بە یەک ڕێگە و بزاڤی هاوبەشەوە ‹کابرای شامی هاوڕێمان زۆر پیاوێکی ڕووخۆش، زمانخۆش و لەسەرخۆ بوو «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. بە یەک ئامانج و باوەڕی هاوبەشەوە ‹سەرۆک و وەفدی هاوڕێی سەردانی بنەماڵەی شەهیدانیان کرد› 🇮🇷 ١و٢. همراه

**هاوڕێزە** / hawřêze/: ئاوەڵناو. شیاو بۆ یەکتر 🇮🇷 مُتناسب

**هاوڕێکراس** / hawřêk(i)ras/: ☜ ئاوەڵکراس

**هاوڕێیی** / hawřêyî/: ناو. هامڕایی؛ هەمڕایی؛ ئامڕایی: ١. کاری دەگەڵ کەوتن؛ خۆ خستنە تەک کەس یان شتێ ٢. یارمەتی؛ کۆمەک 🇮🇷 ١و٢. همراهی

**هاوزا** / hawza/: ☜ هاوساڵ

**هاوزاوا** / hawzawa/: ☜ ئاوەڵزاوا

**هاوزگە** / hawzige/: ☜ هاوساڵ

**هاوزمان** / hawz(i)man/: ئاوەڵناو. هاوزوان؛ هەڤزار؛ هەڤزمان؛ هەمزمان؛ هامزوان؛ هەمزوان؛ یەکزمان؛ بە تایبەتمەندی یەک بوونی زمانی زگماک 🇮🇷 همزبان

**هاوزوان** / hawz(i)wan/: ☜ هاوزمان

**هاوزە** / hawze/: ☜ هاوساڵ

**هاوزەمان** / hawzeman/: ☜ هاوکات[1]ـ٢

**هاوزیندانی** / hawzîndanî/: ئاوەڵناو. هەڤبەند؛ هاوبەند 🇮🇷 همبند

**هاوزێ** / hawzê/: ئاوەڵناو. ١. ☜ هاوساڵ ٢. هاوزێد؛ هاووڵاتی؛ خەڵکی زێدێک 🇮🇷 ١. ☜ هاوساڵ ٢. هموطن

**هاوزێد** / hawzêd/: ☜ هاووڵاتی

**هاوزێدی** / hawzêdî/: ئاوەڵناو. خۆوڵاتی؛ هاووڵاتی 🇮🇷 هم‌ولایتی

**هاوژین**[1] / hawjîn/: چاوگ. خافڵاندن ‹ئەو منالەی بهاوژینە› 🇮🇷 سرگرم کردن

**هاوژین**[2]: ☜ هاوسەر[1]ـ١

**هاوس** / hawis/: ☜ ئاوس

**هاوسا** / hawsa/: ☜ هاوسێ

**هاوسادرگا** / hawsadirga/: ناو. دراوسێ؛ دەراوسا؛ جیرانی ماڵ بە ماڵ 🇮🇷 همسایەی دیوار بە دیوار

**هاوسارەنجێن / hawsařencên/**: ئاوەڵناو. دراوسێی وەزن؛ خراپ دەگەڵ هاوسایان ⁌ همسایه‌آزار

**هاوساڵ / hawsał/**: ئاوەڵناو. هامساڵ؛ هامعومر؛ هامڤەر؛ هاوتەمەن؛ هاوتیرە؛ هاوزا؛ هاوزگە؛ هاوزە؛ هاوزێ؛ هاوعومر؛ هەمساڵ ⁌ همسن

**هاوسان / hawsan/**: ☜ **هەڵماسین**

**هاوساوەزەنگێ / hawsawezengê/**: ناو. تەرکی ژێر بەرە؛ گەمەیەکی لاوانی گوندنشینە ⁌ نوعی بازی جوانان روستا

**هاوسایە / hawsaye/**: ☜ **هاوسێ**

**هاوسایەتی / hawsayetî/**: ☜ **هاوسێتی**

**هاوسایی / hawsayî/**: ☜ **هاوسێتی**

**هاوسفرە / hawsifre/**: ئاوەڵناو. هاوجەم؛ هاوخوان؛ تایبەتمەندی دوو یان چەند کەس کە لە یەک شت دەخۆن ⁌ هم‌سُفره

**هاوسک / hawsik/**: ئاوەڵناو. جمک؛ لفە؛ ئاواڵدوانە ⁌ همزاد

**هاوسنعات / hawsin'at/**: ئاوەڵناو. هەڤ پیشە ⁌ هم‌پیشه

**هاوسنف / hawsinf/**: ئاوەڵناو. هەمپا؛ هاوپیشە ⁌ هم‌پیشه

**هاوسنور / haws(i)nûr/**: ئاوەڵناو. هامسنوور؛ هاوکەوشەن؛ هەڤسینوور؛ هاومەرز؛ هامەرز ‹ئەم ولاتانە هاوسنوورن› ⁌ هم‌مرز

**هاوسوێن / haws(i)wên/**: ☜ **هاوسوێند**

**هاوسوێند / haws(i)wênd/**: ئاوەڵناو. هاوسوێن؛ هاوسۆند؛ هەڤسۆند؛ هاوپەیمان ⁌ هم‌پیمان

**هاوسۆند / hawsond/**: ☜ **هاوسوێند**

**هاوسەر[1] / hawser/**: ناو. هامسەر؛ هەمسەر: ١. هاوژین؛ هاوسەرین؛ هەڤخەو؛ هەڤسەر؛ ئاوجووت؛ هامجووت ‹هاوسەر و دەستەملانی ژانم/ گیانەکەم! نایەوە باڵم تا کەی؟ «هێمن»› ٢. دۆست؛ هەواڵ ⁌ ١. همسر ٢. رفیق

**هاوسەر[2]**: ئاوەڵناو. ١. هاونشین؛ بە بار و دۆخ و کەین و بەینی وەک یەکەوە ‹تۆ هاوسەر ئەو کوڕە نیت، لەتەکیا مەگەڕە!› ٢. هاوتەمەن؛ هاوعومر ⁌ ١. هم‌سطح ٢. هم‌سن

**هاوسەردار / hawserdar/**: ئاوەڵناو. زەدار؛ ژندار؛ خاوەن ژن یان شوو ⁌ مُتأهل

**هاوسەردەم / hawserdem/**: ☜ **هاوچەرخ**

**هاوسەرکەم / hawserkem/**: ئاوەڵناو. ناتەواو؛ بێ بارودۆخ و ئامرازی پێویست ‹با لە ناو ڕەفێقەکانت هاوسەرکەم نەوی!› ⁌ کم از همقطاران

**هاوسەرگیری / hawsergîrî/**: ناو. زەهاسە؛ زەماوەند ⁌ ازدواج

**هاوسەرین / hawserîn/**: ☜ **هاوسەر[1]**-١

**هاوسەرینی / hawserînî/**: ناو. سەرجێیی؛ کاری پێکەوە نووستنی ژن و پیاو ⁌ همخوابگی

**هاوسەفەر[1] / hawsefer/**: ناو. هامسەفەر؛ ئامڕا؛ ڕەفیقی ڕا ‹هاوسەفەرێکی سەیرم لەگەڵدا بوو› ⁌ همسفر

**هاوسەفەر[2]**: ئاوەڵناو. هامسەفەر؛ یەکگرتوو لە ڕێگایەکدا ‹... بەڵام دەزانم ئەوی نووسیومە، یان دیومە، یا لە خۆم قەوماوە، یان لە دەمی برادەرانی هاوسەفەرم قۆزتۆتەوە «هەژار، چێشتی مجێور»› ⁌ همسفر

**هاوسەنگ / hawseng/**: ئاوەڵناو. ١. ☜ **هاوکێش** ٢. لە ئاکار و لێهاتوویدا وەک یەک ⁌ ١. ☜ **هاوکێش** ٢. همطراز

**هاوسەنگەر / hawsenger/**: ئاوەڵناو. هامسەنگەر؛ هاوخەڵ؛ هاومەتەرێز؛ پاڵبەپاڵی یەک لە مەیدانی شەڕدا ‹ئەی ڕەفیقان ئەی عەزیزانی ولات/ ئەی برای هاوسەنگەری جەرگەی خەبات! «هێمن»› ⁌ همسنگر

**هاوسەنگی / hawsengî/**: ناو. هاوکێشە؛ بارودۆخی دامەزران لە سەر بڕیارێک ⁌ مُعادله

**هاوسێ / hawsê/**: ناو. ئاوسا؛ ئاوسێ؛ هاشووشە؛ هاوسا؛ هامسا؛ هەمسا؛ هاوسایە؛ جیران ⇐ همسایه

**هاوسێتی / hawsêtî/**: ناو. هاوسایەتی؛ هاوسایی؛ هاوسێیەتی؛ هاوسێیی؛ هامسایی؛ هەڤسیایی؛ جیرانەتی ⇐ همسایگی

**هاوسێیەتی / hawsêyetî/**: ☜ هاوسێتی

**هاوسێیی / hawsêyî/**: ☜ هاوسێتی

**هاوش / hawiş/**: ناو. باوەش؛ باوش ⇐ آغوش

**هاوشار / hawşar/**: ناو. تافگە؛ تاڤگە ⇐ آبشار

**هاوشاری[1] / hawşarî/**: ناو. هەمشاری؛ هاوولاتی؛ هەڤجی؛ هاموەلاتی؛ هاموەلایەتی؛ هاوولایەتی؛ هەڤباژێری؛ هەمباژاری؛ هەمباژێری؛ هەڤشاری؛ هاوزێد؛ ئاخەبان: ١. ئەوانەی لە شارێکدا دەژین ‹هاوشاری عەزیز! ئەی خەڵک سنە!/ ئەمە بەسەرهات شار ئێوە و منە «حەق‌شناس»› ٢. ئەوانە وا شاری لە دایک بوونیان یەکێکە ‹لەو ولاتە غەریبە، هاوشارییەک فریامان کەوت› ⇐ ١و٢. همشهری

**هاوشاری[2]**: ئاوەڵناو. هاوولاتی؛ هەمشاری؛ هامشاری؛ هاموەلاتی؛ هاموەلایەتی؛ هەمباژاری؛ هەڤباژێری؛ هەڤشاری؛ هەمباژێری؛ خەڵکی یەک شار ‹تووشی شۆفێریکێ هاوشاریمان هاتین› ⇐ همشهری

**هاوشان / hawşan/**: ئاوەڵناو. ئاوشان؛ هامشان؛ هاومل؛ لە قەدر و پایەدا بەرانبەر ‹من چۆن نما ئەکەم کە وەکوو گێسکەکەی هەیاس/ هاوشانی گورگی دێو و سەگی نەفسی سەرکەشم «بێخود»› ⇐ هم‌شأن؛ همپایه

**هاوشانۆ / hawşano/**: ☜ هاوکایە ـ٣

**هاوشانی / hawşanî/**: ناو. هەڤتایی؛ هاونرخی ⇐ همتایی؛ هم‌ارزی

**هاوشکڵ / hawş(i)kił/**: ☜ هاوشێوە

**هاوشۆ / hawşo/**: ☜ هات‌وچۆ

**هاوشیر / hawşîr/**: ناو. هامشیر؛ هەمشیر؛ شیری؛ دوو یان چەند کەس کە بە منداڵی مەمکێکیان مژیبێ ⇐ برادر/ خواهر رضاعی

**هاوشیرە[1] / hawşîre/**: ناو. هامشیرە؛ خۆشک؛ خوەیشک ⇐ همشیره

**هاوشیرە[2]**: ئاوەڵناو. هامشیرە؛ هاوشیر؛ هامشیر؛ شیری ⇐ رضاعی؛ شیری

**هاوشێوە / hawşêwe/**: ئاوەڵناو. هاوشکڵ؛ هاوتەرح ⇐ همشکل

**هاوشێوەیی / hawşêweyî/**: ناو. قام؛ وێکچوویی ⇐ شباهت

**هاوعاشیرەت / haw'aşîret/**: ئاوەڵناو. هاوهۆز؛ لە یەک تیرە و بنەچەکە ⇐ هم‌طایفه

**هاوعومر / haw'umir/**: ☜ هاوساڵ

**هاوغار / hawğar/**: ئاوەڵناو. هەڤبەز؛ هاوهەنگاو لە غارغارێندا ⇐ همگام هم در دویدن

**هاوقا / hawqa/**: ئاوەڵناو. دامێنگیر؛ ئامباز؛ تووشیار ⇐ گریبانگیر

**هاوقان / hawqan/**: چاوگ. ئاوقان؛ ئاوقە بوون؛ تێک‌گیران ‹دامێنم دەو دارە هاوقا› ⇐ گیر کردن (به چیزی)

**هاوقسە / hawq(i)se/**: ئاوەڵناو. ڕێککەوتوو؛ پێکهاتوو لە سەر کار و بڕیارێک ⇐ هم‌قول

**هاوقوتابی / hawqutabî/**: ☜. هاوکلاس

**هاوقۆڵی / hawqołî/**: ناو. یارمەتی؛ یاریکاری؛ هاوکاری ⇐ همیاری

**هاوقەتار / hawqetar/**: ئاوەڵناو. ١. هاودەورە؛ دۆستی یەک دەورە ٢. هاوبەش لە کارێکدا ‹نە هاوزوانێ دلداریم کەرۆ/ نە هاوقەتارێ دەسباریم دەرۆ «مەولەوی»› ⇐ ١. رفیق هم‌دوره ٢. همقطار

**هاوقەد / hawqed/**: ئاوەڵناو. لە بالادا بەرانبەر ⇐ همقد

**هوڕەبا** / huřeba/: ناو. بای سارد و توند و بە مژەوە ☰ باد تند شرقی همراه مه

**هوڕەبەلـــە** / huřebele/: نـــاو. هوڕەبەلـــــەک؛ وڕەبەڵەک؛ گیایەکی تاڵە لـە مێکـووک دەچـێ، بەڵام ڕەنگی سپی واشە ☰ گیاهی تلخ

**هوڕەبەلەک** / huřebelek/: ☜ هوڕەبەلە

**هوڕەبەڵەک** / huřebełek/: ☜ وڕەبەڵەك

**هوڕەم** / huřem/: ☜ هوڕەو

**هوڕەو** / huřew/: ناو. هوڕەم؛ هوژەم؛ ڕەوە بەراز ☰ گلەی گُراز

**هوڕی** / huři/: نـاو. ١. ☜ هەڕگ ٢. گێـژی؛ وڕی ☰ ١. ☜ هەڕگ ٢. منگی

**هوڕینە** / huřîne/: ☜ وڕاوە

**هوڕێنە** / huřêne/: ☜ وڕاوە

**هوزهـوز** / huzhuz/: دەنگـەناو. وەڕەوەڕ؛ دەنگـــی سەیان ☰ صدای سگ‌ها

**هوژم** / hujm/: ناو. تەکان؛ جووڵە؛ کاری ڕاتڵەکان. هەروەها: **هوژم بردن** ☰ تکان

**هوژووم** / hujûm/: ☜ هورووژم

**هوژەم** / hujem/: ☜ هوڕەو

**هوس**[1] / hus/: ناو. ڕەڵم؛ ڕەمڵ ☰ ماسه

**هوس**[2]: ☜ هش[3]

**هوسـتون** / hustun/: نـاو. ئەســـتوون؛ دەکـــەڵ؛ دیکەڵ ☰ دکل

**هوستو** / hustû/: ☜ ئەستۆ

**هوسک** / husk/: ☜ وشك[1]

**هوسکو** / huskû/: ناو. ڕەڵماوی ☰ ریگزار

**هوسورە** / husûre/: ☜ خەزور

**هوسیرە** / husîre/: ☜ خەزور

**هوسیرەما** / husîrema/: ☜ خەسو

**هوش** / huş/: ☜ هش[3]

⊡ **هوش بـون**: دەنگ لێبڕان؛ بێـدەنگ بـوون ☰ ساکت شدن

**هوشتر** / huştir/: ☜ وشتر

**هوشترالۆک** / huşt(i)ralok/: ☜ وشترخۆرە

**هوشترەوان** / huşt(i)rewan/: ☜ وشترەوان

**هوشک** / huşk/: ئاوەڵناو. وشک؛ ویشک؛ ئیشک ☰ خشک

**هوشگ** / huşg/: ئاوەڵناو. لەخۆبایی؛ بە فیز ☰ مُتکبر

**هوشگە** / huşge/: ناو. پارەیێ کە زاوا دەیدا بۆ جیاز کڕین ☰ پولی کـه دامـاد بـرای جهیزیـەی عـروس می‌پردازد

**هوشە**[1] / huşe/: نـاو. ١. قڕ؛ درۆ؛ بافیش ٢. ئامیانی پەنیر ☰ ١. دروغ ٢. پنیرمایه

⊡ **هوشە کـردن**: خـۆ هەڵکێشـان؛ مـەدحی خـۆ کردن ☰ لاف زدن

**هوشە**[2]: دەنگـەناو. هاشە؛ دەنگی بـای بەقـەوەت ☰ صدای تُندباد

**هوشەک** / huşek/: ☜ وشەك

**هوشەکەر** / huşeker/: ئاوەڵناو. بافیشکەر؛ چـاپچی؛ خۆهەڵکێش ☰ لافزن

**هوشـیار** / huşyar/: ئاوەڵـناو. هەشـــار؛ وشــــیار؛ هۆشیار: ١. وریا؛ خـاوەن بـیر و هـۆش ‹لـە بـەر حوکمی نیگایا قاتـە هوشـیار/ هـەتا چـاوی بکـا بـڕ، مەســتە، هــەر مەســت! «مــەحوی»› ٢. خــەوەر؛ نەنووستی؛ بەخەبەر ☰ ١. هوشیار ٢. بیدار

⊡ **هوشیار بـون**: ١. ئاگادار بوون؛ چاوێری کـردن ٢. لە خەو بێدار بـوون ☰ ١. مواظـب بـودن ٢. بیدار بودن

**هوشیار بونەوە**: هۆشیار بوونەوە: ١. ئاگادار بوون لە شتی نەزانراو ٢. لە خـەو خـەوەر بوونـەوە* هەروەها: **هوشیار کردنـەوە** ☰ ١. آگاهی یافتن ٢. بیدار شدن

**هوشـیاری** / huşyarî/: نـاو. هۆشـیاری؛ وریـایی ☰ هوشیاری

**هوکـارە** / hukare/: ئاوەڵـناو. ١. ئـــۆگر؛ خـــوو

پێوەگرتــوو ٢. گــیرۆدە؛ ئـالوودە ☰ ١. مـأنوس ٢. مُعتاد

⊡ **هوکارە بـوون**: ١. خوو پێــوە گـرتن ٢. ئـالوودە بوون ☰ ١. مأنوس شدن ٢. مُعتاد شدن

**هوکارە کـردن**: ئـالوودە کـردن؛ فێـری عادەتـێ کردن ☰ مُعتاد به عادتی کردن

**هوکتـادایش** / huktadayiş/: ئاوەڵـناو. لــە قــوژبن خزیو ☰ خلوتگُزیده

**هوکمـوک** / hukmuk/: ئاوەڵـناو. بــێ‌ســەروبەرە؛ تێکەولێکە؛ تێکەڵ ـ پێکەڵ ☰ درهم ـ برهم

**هول** / hul/: ناو. گوڵێکی زەردە ☰ گلی زردرنگ

**هولکانـدن** / hulkandin/: چاوگ. ڕاکـێش کـردن؛ بە سەر زەویدا کێشان ☰ بر روی زمین کشیدن

**هولـل** / hulil/: نـاو. ١. دەمــی نیمــەڕۆ ٢. هــەل؛ دەرفەت ☰ ١. هنگام ظهر ٢. فُرصت

**هوللا** / hulla/: ناو. کولاوڕۆژنە ☰ روزنه

**هــوللکن** / hulilkin/: ئاوەڵــناو. قــووچ؛ قـــووچ هەڵکەوتوو ☰ مخروطی

**هولله** / hulle/: ناو. حوللەسێ؛ گەمەیەکە بە مـیچ ☰ نوعی بازی با شتالنگ

**هولم** / hulm/: ☜ **هەڵم ـ١**

**هولمیـوم** / hulimyum/: نـاو. تــوخمی کیمیــاوی کانزایی لە دەســتەی لانتانیــدەکان، بــە ژمــارەی ئــەتومی ٦٧ و کێشــی ئــەتومی ١٦٤،٩٣ کــە پێکهاتەکانی میغناتیسییە ☰ هلمیُم

**هولنگ** / huling/: ئاوەڵناو. تراو؛ شل ☰ آبکی

**هولو**[١] / hulû/: ناو. ١. ☜ **هەرمێ** ٢. ☜ **هوڵو**

**هولو**[٢]: ☜ **هلو**

**هولولی**[١] / hulûlî/: نـاو. مەزهەبێکە پەیڕەوانی لایان وایــە پــاش مــەرگ گیانیــان دەچێتــە بــەر زیندەوەرێکی‌تر ☰ حلولی؛ مذهب تناسخ

**هولـولی**[٢]: ئاوەڵــناو. ١. حولحــولی؛ گــەللایی و سەرەڕۆ ٢. بێ‌ئارام؛ هەدانــەدەر ☰ ١. سرسری ٢. ناآرام

**هوله** / hule/: ☜ **هوڵه**

**هولی** / hulî/: ناو. ١. ☜ **هلو** ٢. ☜ **هەڵۆ**

**هولیرەبـاخی** / hulîrebaxî/: نـاو. فاسـۆلیا؛ لۆبیـا؛ ماشەسوورە ☰ لوبیا

**هولیســک** / hulîsk/: ئاوەڵــناو. زمـــانلـــووس؛ کلکەسووتەکەر؛ ماستاوکەر. هــەروەها: **هولیسکی** ☰ مُتملق

**هولیلک** / hulîlik/: ناو. ١. چەرخ؛ سەقر؛ باڵدارێکی ڕاوکەرە ٢. خەرتەل؛ ورخال ☰ ١. صـقر؛ پرنـدەای شکاری ٢. لاشخور

**هوڵ** / huł/: ☜ **هالۆق**

**هوڵف** / hułif/: نـاو. کـونی زۆر گوشـاد ☰ سـوراخ فراخ

**هوڵفدو** / hułifdû/: ☜ **هەپس**

**هوڵـوەزە** / hułweze/: نــاو. کـــەمکۆڵ؛ تێکولـــی سەوزی گوێز ☰ پوست سبز گردو

**هوڵۆڵ** / hułoł/: ئاوەڵناو. هلۆڵ؛ هەڵۆڵ؛ ناوخالــی. هەروەها: **هوڵۆڵی** ☰ کاوک

**هوڵۆنج** / hułonc/: ☜ **هێڵنج**

**هوڵـو** / hułû/: ناو. هلوو؛ هولوو؛ هەشتالوو؛ کـۆخ؛ قۆخ؛ خۆخ: ١. دارێک بە گەڵای باریک و درێژەوە کــە لێوارەکــەی دانووشــتاوە، گوڵــی گــەورەی پەمەیی مەیلەو ئەرخەوانی دەر دەکا ٢. میـوەی گۆشتن، درشت، شیرین و ئاوداری ئـەو دارە کـە پێســـتێکی ناســک و کولــکنی زەرد و ســوور و پێشەی درشتی چێوی هەیە ☰ ١و٢. هلو

**هوڵـەمەڕ** / hułemeř/: نـاو. بنگوفــک؛ بنگــوف؛ ئاغەڵی ئاژەڵ ☰ آغُل

**هوم** / hum/: نـاو. شوومی؛ بێ‌فەڕی ‹فلانکـەس بـە هومە› ☰ شومی

**هوما** / huma/: ناو. پیرۆزە؛ باڵـدارێکی چیرۆکانـە، بەختــەوەری دێنــێ ‹شــارەزای شــارای ســارای

تەریقەت/ هومای هەوای ئەوج سەمای حەقیقەت «مەلا سەلاحەددینی پاوەیی»› ☰ هُما

**هومائاسا** / huma'asa/: ئاوەڵناو. پیرۆز وەک هوما ‹کە ئیمرۆ کوندەبووی ئەملاک و خانووی عیترەتی ئەو بی/ سبەی چۆن ئەچیە ژێر سایەی هومائاسای پێغەمبەر؟ «بێخود»› ☰ هُماگون

**هومار** / humar/: ☜ هامار

**هومال** / humal/: ناو. ڕکابەر؛ هاوچاو؛ بەربەرەکانیکەر ☰ رقیب

**هومایل** / humayil/: ناو. هومایی؛ مەرمەڕشا؛ پارچەی سپی سادە؛ خامهەلاوی زۆر باش کە دەکرێتە کراس ☰ چلوار

**هومایون**[۱] / humayûn/: ناو. لە دەزگاکانی مووسیقای ئێرانی ☰ همایون

**هومایون**[۲]: ئاوەڵناو. پیرۆز؛ هەزەخ؛ مبارەک ☰ فرخُنده

**هومایونی** / humayûnî/: ناو. جۆرێ خەت ☰ نوعی خط

**هومایی** / humayî/: ☜ هومایل

**هومبان** / humban/: ☜ هەنبانە

**هومبانی** / humbanî/: ئاوەڵناو. قاپۆرکدار (جانەوەر) ☰ لاک دار (حیوان)

**هومبەر** / humber/: ئاوەڵناو. همبەر؛ بەرامبەر؛ بەرانبەر ☰ برابر

**هومبی** / humbî/: ☜ هێوەرژن

**هومە** / hume/: ناو. هوومە؛ کووپە؛ دەفری سواڵەتی زل و دەم ئاواڵە ☰ خُم

**هومێ** / humê/: ☜ نومێد

**هومێد** / humêd/: ☜ نومێد

**هومێدوار** / humêdwar/: ☜ هیوادار

**هومێدواری** / humêdwarî/: ناو. تەماداری ☰ امیدواری

**هون** / hun/: جێناو. ئێوە ☰ شما

**هوندرو** / hund(i)rû/: ناو. ئەندەروونی ☰ اندرونی

**هوندور** / hundûr/: ناو. ئەندەروون؛ ژوورەوە ☰ اندرون

**هوندورین** / hundûrîn/: ناو. ژوور؛ هەناو؛ دەروون ☰ درون

**هونژەک** / hunjek/: ناو. وەنەوز؛ چورت؛ خەوەنووچکە ☰ چُرت

**هونژین** / hunjîn/: چاوگ. ۱. وەنەوزدان؛ خەونووچکە بردنەوە ۲. ڕاکشان و درێژ بوون بۆ سووکەخەوێک ۳. پۆنژین؛ خەو بردنەوە ☰ ۱. چُرت زدن ۲. دراز کشیدن برای خواب کوتاه ۳. خواب بردن

**هونگوست** / hungust/: ☜ ئەنگوست

**هونگوستر** / hungustir/: ☜ ئەنگوستیلە ـ۲

**هونگوستیل** / hungustîl/: ☜ ئەنگوستیلە ـ۱

**هونگوستیلک** / hungustîlik/: ☜ ئەنگوستیلە ـ۱

**هونگولیر** / hungulîr/: ناو. ئەنگوستیلە؛ ئەنگووسەوانە ☰ انگشتانه

**هونگولیسکێ** / hungulîskê/: ☜ کاڵەمستێن

**هونە** / hune/: ناو. خەنە ☰ حنا

**هونەر** / huner/: ناو. هنر؛ هنەر؛ هەنەر؛ حوننەر؛ حونەر: ۱. کاری شاندان و دەربڕینی وەستایانەی هزر و بۆچوون لە دیاردە و ڕووداوەکانی جەهانی دەرەوە ‹ئەمڕۆ لە کن زەمانە هونەر بۆتە قەشمەری/ شێری ژیانی بۆ چییە؟ مەیموونییە گەرەک! «مەحوی»› ۲. وەستایی و لێهاتوویی لە پیشاندانی ئەو بۆچوونانە ‹لە خەو هەڵسن، درەنگە، میللەتی کورد! خەو زەرەرتانە/ هەموو تاریخی عالەم شاهیدی فەزل و هونەرتانە «ئەحمەد موختار بەگ»› ۳. دەسڕەنگینی؛ جوانکاری؛ بەکار هێنانی هەستیارانە و داهێنەرانەی خەیاڵ، بۆ بەرهەم هێنانی بەرهەمی جوان و ڕازاوە ‹فیری زانست و هونەر بوو ئەو لە سایەی خوێندنی/ تۆش تەشیمان بۆ

دەرپسی، یادگاری شیرنە! «هێمن»» ٤. هونەرە جوانەکان (وەک: مووسیقا، نیگارقانی، پەیکەرتراشی، شیعر، سینەما و...) ٥. لێزانی و کارامەیی بە هۆی ئەزموون، دیتن یان خوێندنەوە (هونەر بۆ رووخۆشیی بوو/ کە خەوشی داپۆشیبوو! «گۆران») ٦. *[مەجاز]* کاری گرینگ و بەرچاو (لەو ساڵەوە کە حاکمی بابان بەدەرکران/ نەیدیوە کەس لە چیهرەیی کەس جەوهەری هونەر «سالم») ⚑ ١تا٦ هُنر

**هونەراوی / hunerawî/**: ئاوەڵناو. هونەری؛ هونەرمەندانە ⚑ هُنری

**هونەرستان / huneristan/**: ناو. هنەرگە؛ هونەرگە؛ فێرگەی هونەر؛ قوتابخانەی دواناوەندی کە دەرسی هونەر یان فێرکاری تێدا دەڵێنەوە ⚑ هنرستان

**هونەرگە / hunerge/**: ☜ **هونەرستان**

**هونەرمەن / hunermen/**: ☜ **هونەرمەند**

**هونەرمەند[1] / hunermend/**: ناو. هنەرمەند؛ هنەروەر؛ هنەری؛ هونەروەر؛ هونەرمەن؛ حونەرمەند؛ کەسێ کە بەرهەمی هونەری بەدی دینێ (هونەرمەند و ژیانی خۆش مەحاڵە/ هونەرمەند رەنجەڕۆیە ژینی تاڵە «هێمن»). ⚑ هُنرمند

**هونەرمەند[2]**: ئاوەڵناو. هونەروەر؛ هنەرمەند؛ هنەروەر؛ هونەرمەن؛ بە هونەر؛ مایەوەر؛ حونەرمەند؛ جوانکار؛ دەسڕەنگین؛ لێهاتوو بۆ بەدیهێنانی بەرهەمی هونەری (... تا هەموو دنیا بزانێ کورد هەر لە دێرزەمانەوە چەند عاشقە مۆسیقا بووە. بە تایبەتی ئەحمەدی خانی هونەرمەند چەندی لێ شارەزا بووە. «هەژار، *مەم و زین*») ⚑ هنرمند

**هونەرمەندانە / hunermendane/**: ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. هونەری ⚑ هُنرمندانه

**هونەرمەندی / hunermendî/**: ناو. هنەری؛ هونەروەری؛ دەسڕەنگینی؛ دۆخ یان چۆنیەتی هونەرمەند بوون ⚑ هُنرمندی

**هونەروەر / hunerwer/**: ئاوەڵناو. پڕهونەر؛ لە هونەر زان ⚑ هنرور

**هونەروەری / hunerwerî/**: ☜ **هونەرمەندی**

**هونەری[1] / hunerî/**: ئاوەڵناو. سەر بە هونەر (فیلمی هونەری) ⚑ هنری

**هونەری[2]**: ئاوەڵکار. هونەرمەندانە (هونەری چاو لە هەموو شتێک دەکا) ⚑ هنرمندانه

**هونی / hunî/**: ئاوەڵکار. ئاوا؛ ئاوها؛ بەمجۆرە ⚑ چنین

**هونین / hunîn/**: چاوگ. هۆنین؛ هۆندنەوە ⚑ ریسیدن

**هونینەوە / hunînewe/**: چاوگ. مووناندن؛ بادان ⚑ ریسیدن

**هووێزی / huwêzî/**: ناو. ١. خشت؛ زەرگی شەڕ؛ جۆرێ نێزە بۆ شەڕ ٢. گۆپاڵ؛ کۆپار؛ گورز ٣. باقە؛ دەستەی بەسراو لە گیا ٤. دەسکەگوڵ ⚑ ١. نوعی نیزەی جنگی ٢. گُرز ٣. بستەی گیاه ۴. دستەگُل

**هوە / h(i)we/**: ☜ **هویە**

**هوها / huha/**: دەنگ. وتەی گاڵتە پێکردن ⚑ زِکی

**هویچ / h(i)wîç/**: ☜ **هێچ[2]**

**هویری / h(i)wîrî/**: ناو. وردی؛ سەرنج ⚑ دقّت

**هویسیر / h(i)wîsîr/**: ☜ **هویسیل**

**هویل / h(i)wîl/**: ☜ **هەوێڵ**

**هویی / huyî/**: ☜ **هویە**

**هوێتن / h(i)wêtin/**: چاوگ. خەوتن؛ خەفتن؛ نووستن ⚑ خوابیدن

**هوێشە / h(i)wêşe/**: ☜ **هێشوو**

**هوێلانن / h(i)wêlanin/**: چاوگ. ون کردن ⚑ گُم کردن

**هۆ[1] / ho/**: ناو. ١. سەبەب؛ سۆنگە ٢. همێ؛ ئومێد ٣. قەرەبوو؛ کار و ڕەوتی تێهەڵێنانەوە ٤. فایدە؛

قازانج ‹بێهۆیە بە لایەوە ناچم› ٥. دەرفەت؛ هەل ‹هۆیە و هەر ئەمڕۆیە «مەسەل»› ٦. خوو؛ عادەت ‹پیس هۆی پێوە گرتووە› ☰ ١. سبب ٢. امید ٣. جُبران ٤. فایده ٥. فُرصت ۶. اُنس؛ عادت

⊡ **هۆ بڕان:** نائومێد بوون لە کارێ یان کەسێ ☰ مأیوس شدن

**هۆ دانەوە:** هۆ کردنەوە؛ بەهرە پێ گەیاندن و تۆلە کردنەوەی زیان و تەمەڵی ‹زەرەرم کردبوو بەڵام ئەم جارە هۆی دایەوە› ☰ فایده رساندن

**هۆ کردنەوە:** ☜ **هۆ دانەوە**

**هۆ گرتن:** ١. عادەت کردن ٢. خوو پێگرتن ☰ ١. عادت کردن ٢. خو گرفتن

**هۆ**[٢]: ئاوەڵناو. ١. بڵند؛ هل ٢. زۆر، فرە ☰ ١. بُلند ٢. زیاد

**هۆ**[٣]: ئاوەڵکار. ١. هۆو؛ جواب لە باتی بەڵێ ‹ـ حەسەن! ـ هۆ› ٢. ئاوا؛ ئاوها ☰ ١. بلی ٢. اینطور

**هۆ**[٤]: دەنگەناو. ١. وتەی جووتیار لە جووتدا بۆ لێخوڕین و وەرسووڕاندنی گاجووت ‹هۆی لێ کە بڕوا!› ٢. وتەی بانگ کردن لە دوورەوە ‹هۆ کاکی ڕێبوار!› ☰ ١. کلمەی راندن و برگرداندن گاو هنگام شخم زدن ٢. های؛ حرف ندای دور

**هۆ**[٥]: جێناو. خۆ؛ خوە؛ خود ‹هۆمان› ☰ خود

**هۆ**[٦]: دەنگ. وتەی پارازتن لە شتێ ‹هۆ! پێت ئەڵێم نەچی!› ☰ هان

**هۆ ـ**[٧]: پێشوشە. ١. بۆنە؛ هۆکار ‹هۆزان› ٢. خوو؛ عادەت ‹هۆگر› ☰ ١. سبب ٢. عادت

**هۆئەوێ** / ho'ewê/: جێناو. ئەوێ؛ ئەویا ☰ آنجا

**هۆب** / hob/: ☜ **هۆبە**

**هۆباڵ** / hobał/: ئاوەڵناو. ئۆباڵ؛ ئازوبەزە ☰ وبال

**هۆبڕاو** / hob(i)řaw/: ئاوەڵناو. نائومێد لە کەس یان شتێک ‹لەم کوڕەم هۆبڕاوم› ☰ نااُمید

**هۆبە** / hobe/: ناو. ئۆبە؛ هۆب؛ زۆم؛ کۆن؛ کۆمەڵێک ڕەشماڵ پێکەوە ‹دێم بەرەو هۆبە و هەواری باسەفا/ دێم بەرەو لادێ، بەرەو کانگای وەفا «هێمن»› ☰ اوبه؛ محل برپایی چند چادر

**هۆبەڵێ** / hobełê/: دەنگ. بەڵێ؛ بەرێ ☰ بلی

**هۆبەنشین** / hobenişîn/: ئاوەڵناو. هۆبەیی؛ هۆبەیێ؛ چادرنشین ☰ چادرنشین

**هۆبەیی** / hobeyî/: ☜ **هۆبەنشین**

**هۆبەیێ** / hobeyê/: ☜ **هۆبەنشین**

**هۆبێ** / hobê/: ناو. جۆرێ جانەوەر لە تیرەی مارمێلکە ☰ چلپاسه

**هۆپ** / hop/: دەنگ. ١. وتەی پەسەند کردن ٢. وتەی دەنگ دانی وشتر ٣. وتەی گاڵتە کردن (زیاتر بە کەسێ کە بایەکی لێ بۆتەوە) ☰ ١. آفرین ٢. حرف راندن شتر ٣. حرف تمسخُر

⊡ **هۆپ دانەوە:** با دانەوە؛ گەڕانەوە؛ هەڵەوگەڕیان ☰ برگشتن

**هۆپ کرن:** باز دان لە بڵندەوە ☰ پریدن از بلندی

**هۆپپالا** / hoppala/: ☜ **هۆپپەلا**

**هۆپپلا** / hopp(i)la/: ☜ **هۆپپەلا**

**هۆپپەلا** / hoppela/: ئاوەڵناو. هۆپپالا؛ هۆپپلا؛ لاوی نازنازی و خاو و خلیسک ☰ تازەجوان

**هۆپل** / hopil/: ئاوەڵناو. لاواز؛ لەجەر ☰ لاغر

**هۆپەڵ** / hopeł/: ناو. تۆپەڵ؛ تۆپەڵە بەفر یان قوڕ ☰ گلوله از برف یا گِل

**هۆپەڵان** / hopełan/: ناو. شەڕەتۆپەڵە بەفر و قوڕ ☰ بازی با گلوله برف و گِل

**هۆپ ـ هۆپ** / hop hop/: دەنگ. وتەی دنە دانی وشتر بۆ ڕۆیشتن ☰ کلمەی راندن شتر

**هۆت** / hot/: ☜ **حەوت**

**هۆتۆ** / hoto/: ئاوەڵناو. گەللایی؛ بەرەڵڵا؛ خوێڕی؛ لاسار؛ گوێنەدەر بە هیچ ☰ لاأُبالی

**هۆتەر** / hoter/: ناو. چۆلەچرا؛ خەتیرە ☰ مشعل نیمسوز

**هۆتێل** / hotêl/: ☜ **هوتێل**

**هۆجەنە** / hocene/: ناو. هۆچنە؛ هۆگە؛ دۆخین؛ دێخوون؛ بەنەخوێن ‹هۆجەنەیەک لە مووە بەشی خاوەنی گووە! «مەسەل»› 🇮🇷 بند شلوار

**هۆجەنەکێش** / hocenekêş/: ناو. دادۆخین؛ داررووکەیە سەرێکی کون کراوە دۆخینی پێ لە دەرپێ دەکێشن 🇮🇷 چوبکی سوراخ دار کە بە وسیلەی آن بند شلوار را بە نیفە می‌کشند

**هۆچ** / hoç/: ناو. بابۆلە؛ تیکەی پێخۆر تێوەپێچراو 🇮🇷 ساندویچ

**هۆچنە** / hoç(i)ne/: ☜ هۆجەنە

**هۆخ** / hox/: ناو. ١. بەش؛ پاژ؛ بەهر؛ پشک؛ بێش ٢. هەردی تەواو کێڵدراو ٣. خۆخە؛ درگای پچووک لە ناو دەروازەدا 🇮🇷 ١. سهم؛ حصه ٢. زمین کامل شخم شده ٣. در ورودی کوچک در میان دروازه

**هۆدا** / hoda/: ناو. ئۆدا؛ دایک 🇮🇷 مادر

**هۆداخ** / hodax/: ناو. پنجی دەمووکانە 🇮🇷 بوتەی مویزک

**هۆدار** / hodar/: ناو. دەمووکانەی کوڵێندراو کە ڕاوی مەلی پێ دەکەن 🇮🇷 مویزک عسلی

**هۆدڕە** / hod(i)ře/: ناو. هوڕە؛ هووڕە؛ جۆرێ مێشوولەی دندوک درێژ کە دەبێتە هۆی تا و لەرز 🇮🇷 پشەی مالاریا

**هۆدە**[١] / hode/: ناو. ئۆدە؛ ژوور؛ دیو ‹تا نەڕووخاوە بلا پڕ بێ لە خۆشی و شادی/ تازە پێی ناوێ ئەمن هۆدەیی خۆم مەحکەم کەم «هێمن»› 🇮🇷 اُتاق

**هۆدە**[٢]: ناوەلکار. لەوێوە؛ هێمایە بۆ دوور 🇮🇷 از آنجا

**هۆدەنگ** / hodeng/: ناو. بانەشان؛ وتەی گازی کرن 🇮🇷 حرف ندا

**هۆر**[١] / hor/: ناو. ١. خۆر؛ ڕۆژی لە عاسمان ٢. عەور؛ هەور 🇮🇷 ١. خورشید ٢. ابر

**هۆر گەزتن**: ☜ هۆر گەستن

**هۆر گەستن**: هۆر گەزتن؛ تاو بردن؛ تاوانگاز بوون 🇮🇷 آفتابزده شدن

**هۆر**[٢]: ناوەلناو. هەر؛ پێکەوە ‹هۆردوو› 🇮🇷 هر

**هۆر**[٣]: پێشگر. هەڵ ← هل ← لە سەرەتای ڕەگی کار و چاوگەوە دێ ‹هۆرکێشتەی؛ هۆرئامای؛ هۆردای؛ هۆربڕنای؛ هۆرمالای› 🇮🇷 بَر ـ

⊡ **هۆر داشتن**: هەڵماڵین؛ بەرەو بان هەڵدانەوە 🇮🇷 ورمالیدن؛ بالازدن

**هۆر دان**: ١. بۆ بالا بردن ٢. هەڵدانی چادر 🇮🇷 ١. بالا زدن ٢. برپا کردن خیمه

**هۆرا** / hora/: ناوەلکار. لە خۆیدا؛ زاتەن 🇮🇷 اساساً؛ ذاتاً

**هۆراسان**[١] / horasan/: ناو. خاوەر؛ ڕۆژهەلات؛ لایێ کە خۆری لێوە دێ 🇮🇷 مشرق؛ خاور

**هۆراسان**[٢]: ناوەلناو. ١. ترساو؛ ترس لە دڵ ٢. وەڕەز؛ جاڕز 🇮🇷 ١. هراسان ٢. پریشان

**هۆرامان** / horaman/: ناو. ١. ڕەوتی زەردە کەوتن؛ خۆر هەڵدان ٢. ڕۆژهەلات؛ خاوەر 🇮🇷 ١. طلوع آفتاب ٢. مشرق

**هۆراوا** / horawa/: ناو. ١. خۆراوا؛ خۆرنشین ٢. وڵاتی خۆرنشین 🇮🇷 ١. غروب ٢. مغرب

**هۆربەشان** / horbeşan/: ناو. هۆربەشیان؛ تاوهەلات؛ دەمی تاو کەوتن 🇮🇷 زمان طلوع خورشید

**هۆربەشیان** / horbeşyan/: ☜ هۆربەشان

**هۆرپاتە** / horpate/: ناوەلناو. ١. پەرتاوتە؛ هەڵپاچراو ٢. قەیچیبڕ؛ بە مقەست بڕدراو 🇮🇷 ١. هرس شده ٢. بُریده با قیچی

**هۆرپاتەی** / horpatey/: چاوگ. پاتەی؛ هەڵپەرتاوتن 🇮🇷 چیدن و بُریدن

**هۆرپڕای** / horpiřay/: چاوگ. هەڵپەڕین 🇮🇷 رقصیدن

**هۆرپە** / horpe/: ناو. کلوو؛ گلۆلە لە خوری 🇮🇷 گلولەی پشمی

**هۆرتک** / hortik/: ناو. زارۆی ساوای ناحەز و درێو 🇮🇷 نوزاد زشت

**هۆرتمە / hort(i)me/**: ناو. دەربیچە؛ ڕۆچنە لە درگا و پەنجەرەدا بۆ لێ ڕوانین 🇮🇷 دریچە

**هۆرتومان / hortuman/**: ناو. کزن؛ جیدانە؛ گادانە 🇮🇷 گاودانە

**هۆرتە[1] / horte/**: ناو. ١. وەرتە؛ مافوورەی گەورە ٢. دام و دەستووری ناو خەڵک ٣. هاوردە؛ داهات 🇮🇷 ١. قالی بزرگ ٢. رسم و عادت ٣. درآمد

**هۆرتە[2]**: دەنگەناو. وتەی جووتیار بۆ خەت ڕاست کردنەوە 🇮🇷 کلمەی بە راە آوردن گاو در شخمزنی

**هۆرتەکنای / horteknay/**: چاوگ. هەڵتەکاندن؛ تەتەڵە کردن 🇮🇷 تکاندن

**هۆرتەوبەرە / hortewbere/**: ناو. ١. داب؛ دام و دەستوور ‹بەپێی هۆرتەوبەرەی ئەم ولاتە، کاری وا ئابرووچوونە› ٢. داهات و خەرج ‹هێشتا دە هۆرتەوبەرەی خۆم ناگەم› 🇮🇷 ١. سُنَّت ٢. دخل و خرج

**هۆرد / hord/**: ☜ هورد

**هۆردار / hordar/**: ناو. فاقە؛ جۆرێ تەڵە 🇮🇷 نوعی تلە

**هۆردای / horday/**: چاوگ. هەڵدان؛ بەرەو سەر خستن 🇮🇷 رو بە بالا انداختن

**هۆردڕون / hord(i)řûn/**: چاوگ. بەرەو ژوور دڕاندن 🇮🇷 وردریدن

**هۆردوک / horduk/**: ☜ هەردوکیان

**هۆردوکیان / hordukyan/**: ☜ هەردوکیان

**هۆردو[1] / hordû/**: ناو. لەشکر؛ سپا؛ ئۆردوو ‹چینی کاکۆڵی کە پەخشان بوو بە لای ملیا، وتم:/ سەر بیلادی شەرق ئەچێ وا دیارە هۆردووی غەربی شەو «بێخود»› 🇮🇷 اردو؛ قشون

**هۆردو[2]**: ☜ هەردو

**هۆردوبەز / hordûbez/**: ناو. ١. ئۆردووبەز؛ بنکەی سانەوەی سپا ٢. کاری دابەزینی لەشکر لە شوێنێ 🇮🇷 ١. جای اتراق سپاە در راە ٢. اتراق سپاە در جایی

**هۆردوگا / hordûga/**: ☜ ئۆردوگا

**هۆردە / horde/**: ناو. شلە؛ شێوی تراوی دانەوێڵە 🇮🇷 آش آبکی حبوبات

**هۆرز / horz/**: ناو. هرزا؛ جۆرێ هەڵپەڕکێ کە ڕەشبەڵەکە و هەڵپەڕکێکەران دەبنە کۆز 🇮🇷 نوعی رقص گروهی

**هۆرزای / horzay/**: ☜ هۆرسەی

**هۆرزنایوە / horznaywe/**: چاوگ. هەڵساندنەوە 🇮🇷 برخیزاندن

**هۆرسەی / horsey/**: چاوگ. هۆرزای؛ هەڵسان 🇮🇷 برخاستن

**هۆرڤە / horve/**: ناوەلکار. لە هۆ وەڕا؛ هێما بۆ دوور 🇮🇷 از آنجا

**هۆرکریان / horkiryan/**: چاوگ. ئایسان؛ پێ کران؛ داگیرسان 🇮🇷 افروختن

**هۆرکەوت / horkewt/**: ☜ هەڵکەوت

**هۆرگرتن / horgirtin/**: چاوگ. ١. بڵند کردن؛ هەڵگرتن ٢. پێ کردن؛ ئایساندن 🇮🇷 ١. برداشتن ٢. افروختن

**هۆرگرتەی / horgirtey/**: چاوگ. هەڵگرتن؛ ئەڵگردن ‹جە سەر دووکانچەی شای سەر توجاران/ هۆرگرتم کالای بالای نازاران «مەولەوی»› 🇮🇷 برداشتن

**هۆرگڕنای / horgiřnay/**: چاوگ. پێ کردن؛ داگیرساندن 🇮🇷 برافروختن

**هۆرگە / horge/**: ناو. ڕۆژاوا؛ لای تاوهەڵات 🇮🇷 مشرق

**هۆرگەز / hogez/**: ☜ هۆرگەستە

**هۆرگەستە / horgeste/**: ناوەلناو. هۆرگەز؛ تاوبردوو؛ تاوگەز؛ تاوانگاز 🇮🇷 آفتابزدە؛ آفتابسوختە

**هۆرگێلان / horgêlan/**: چاوگ. هۆرگێلای؛ زڤرین؛ وەرسووڕان؛ وەرگەڕان؛ وەرچەرخان 🇮🇷 چرخیدن

**هۆرگێلانن / horgêłanin/**: چاوگ. ژێر و ڕوو کردن 🇮🇷 چرخاندن

**هۆرگێلای / horgêłay/**: ☜ هۆرگێلان

**هۆرگێلنـای / horgêłnay/**: چاوگ. هەڵـگەڕاندنەوە؛ هۆرگێلانن 🇮🇷 برگرداندن

**هـۆرم / horm/**: نـاو. خــەو؛ خــەون؛ وەرم؛ هــورم؛ هەون؛ هۆن؛ ئەوەی لە کاتی خەوتن لە مێشـکی گیانداردا وێنا دەکرێت 🇮🇷 رؤیا

**هـۆرمزە / horm(i)ze/**: نـاو. گــوزران؛ ورمــزە 🇮🇷 گُل‌گاوزبان

**هۆرنگ / horing/**: ☜ هەورنگ

**هۆروێلنـەی / horwêłney/**: چـاوگ. ســەرنخوون کردن 🇮🇷 واژگون کردن

**هۆرووم / horûm/**: ناو. ملـوور؛ گیایەکـە لـە گـەنم دەکا 🇮🇷 چچم پر گل

**هۆرە / hore/**: نـاو. ١. دەوروبەر؛ پەڕانپەڕ؛ دۆرمادار ٢. پوازی ئەستوور بۆ قەڵش وێک نەهاتنی دارێ کە دەیشکێنن بە تـەور ‹قـەڵای مـیران بـە دەس ناکەس دەنەقشێ/ کە دار هۆرەی لـە خـۆی بـێ زوو دەقەڵشێ «هێمن»› ٣. سەیرانگەهـ ؛ سـەیرانگا ٤. کێوی بڵند ٥. قامێکی بەناوبانگی نـاو جافانـە ٦. نەرمەگۆرانی بە سۆزە ‹بـازووی کـوردی کرێکـارن/ هۆرەی دوای جـووتی جووتیـاران «شـێرکۆ»› 🇮🇷 ١. پیرامون ٢. گاوه ٣. گردشگاه ٤. کوه بلنـد ٥. آهنگـی است ٦. زمزمه

**هۆرەچڕ / horeçiř/**: ناوەڵـناو. بە زانست و توانسـتی هۆرە چڕین 🇮🇷 خوانندەی «هۆرە»

**هۆرەگورگی / horegurgî/**: ناو. گورگـەزێ؛ دۆخـی باران و خۆرەتاو پێکەوە 🇮🇷 حالت بارش در آفتاب

**هــۆرەوری / horew(i)rî/**: نــاو. پەلکەزێرینــــە؛ کۆلکەزێرینە 🇮🇷 رنگین‌کمان

**هۆرەهۆر / horehor/**: دەنگـەناو. دەنگـی نالانـدنی بەرزی گا و چێڵ 🇮🇷 ماغ ـ ماغ گاو

**هۆری / horî/**: ☜ حۆری

**هۆریشـە / horîşe/**: نــاو. ١. ڕێــــوی؛ ڕواس ٢. کەروێشک؛ کەورێشک 🇮🇷 ١. روباه ٢. خرگوش

**هۆریە / horye/**: ☜ حۆری

**هۆریەس / horyes/**: ☜ هەرەس ـ١

**هۆرێزان / horêzan/**: چاوگ. هۆرێزای؛ هۆرێزیای؛ هۆرێستەی؛ هەڵسان 🇮🇷 برخاستن

**هۆرێزای / horêzay/**: ☜ هۆرێزان

**هۆرێزنـای / horêznay/**: چـاوگ. هەڵســاندن 🇮🇷 برخیزاندن

**هۆرێزیای / horêzyay/**: ☜ هۆرێزان

**هۆرێستەی / horêstey/**: ☜ هۆرێزان

**هۆڕ[1] / hoř/**: نـاو. ١. گەوڕ؛ تەژێر؛ ئاغەڵ ٢. هــووڕ؛ جەواڵی زۆر گەورەی یەکتایی یان دووتایی ‹نانی شوانی، چ لە هۆڕی، چ لە تۆڕی «مەسـەل»› ٣. وڕە؛ بای بە تەپوتۆزەوە ٤. زەوینی زۆر نەرم کە سوار لێی دەرناچێ 🇮🇷 ١. آغُل ٢. جـوال جانخـانی ٣. بـاد همراه با گردوغبار ٤. زمین بسیار نرم

**هـۆڕ[2]**: ناوەڵـناو. بــیچم ســـەیر و ســـەمەرە 🇮🇷 عجیب‌الخلقه

**هۆڕ[3]**: دەنگەناو. ١. بۆڕە؛ دەنگی زلی گا و چێڵ لـە تاوی شـتێ ٢. دەنگـی قـەو ‹لـە شـەق و هـۆڕی دۆمینە و قومار/ ئینسان لە ژینـی خـۆی ئـەبێ بێـزار «بێکەس»› ٣. *[کینایە]* دەنگی بەرزی گریـان 🇮🇷 ١. ماغ گاو ٢. صدای بم و بلند ٣. صدای بلند گریه

**هۆڕاندن / hořandin/**: چـاوگ. دەنـگ دەرهـاتنی ڕەشەوڵاخ 🇮🇷 ماغ کشیدن گاو

**هۆڕاو / hořaw/**: ناو. گۆلی گەورە؛ ئەسـتێرەی زل 🇮🇷 استخر بزرگ

**هۆڕاوە / hořawe/**: ☜ وڕاوە

**هۆڕژن / hořjin/**: دەنگەناو. دەنگی بەرزی گریـان و شەپۆڕ 🇮🇷 صدای بلند شیون

**هۆڕگڕیـای / hořgiřyay/**: چاوگ. هەڵـگڕان؛ ئـاگر

گردن ‹شەمع شام شووم ماتەم هۆڕگریا/ تەل تای سەمتوور شای و زەرق بڕیا «مەولەوی»› ⚑ افروختن؛ آتش گرفتن

**هۆڕن**[1] / hořin/: ناو. هۆڕنە؛ کێوی بلند کە تۆقە سەری دەشتایی و گۆڕ بێ ⚑ کوه بلندی که قله‌اش مسطح باشد

**هۆڕن**[2]: دەنگ. بۆق و بۆڕەی ماشین ‹وەک هۆڕنی لەندکرۆزەری سەردزەکان/ خەو لە چاوی عومەر خاوەر دەتارێنێ «پەشێو»› ⚑ بوق و صدای ماشین

**هۆڕنە** / hoř(i)ne/: ناو. ١. ☜ هۆڕن[1] ٢. زۆزانا بلند؛ کێوی بەرزی جێ هەوار ⚑ ١. ☜ هۆڕن[1] ٢. کوه بلند ییلاقی

**هۆڕە** / hoře/: ☜ هۆڕەهۆڕ

⊡ **هۆڕە هاتن**: *[کنایە، بلار]* هیچ لێ نەزانین؛ سەر لێ دەرنەکردن ‹لە قالی کردنا هۆڕەی تێ!› ⚑ هِر از بِر نشناختن

**هۆڕەبا** / hořeba/: ناو. باهوڕ؛ باهۆڕ؛ وڕەبا ⚑ تُندباد سرد همراه با مه

**هۆڕەهۆڕ** / hořehoř/: دەنگەناو. هۆڕە؛ دەنگی نالاندنی بەرزی گا و چێڵ ‹هات خرینگەی زەنگ و قوڕ، لوشمەلوشم و هۆڕەهۆڕ/ هۆقەهۆق و بۆڕەبۆڕ، حیلەی جانووئەسپی تۆڕ «هێمن»› ⚑ ماغ بلند گاو

**هۆز**[1] / hoz/: ناو. هووز: ١. خێڵ؛ عەشیرەت؛ عاشیرەت ‹هۆز نەبەزی، لەتەچن بەزی «مەسەل»› ٢. ئاپۆرە؛ کۆمەڵێ مرۆ ‹هۆزی کورد! یاخوا نەمێنم بۆ هەناسەی سەردتان/ بۆ خەم و ئاهی دەروون و بۆ دڵەی پڕدەردتان! «؟»› ٣. میللەت؛ نەتەوە ‹هۆز لە عێل ناکەن پێشێل «مەسەل»› ⚑ ١. ایل؛ عشیره ٢. گروهی از مردم ٣. ملت

▪ **هۆز**[2]: پاشەوشە. ـ هێز ‹باهۆز، واتا: بای بەقەوەت› ⚑ قوی

**هۆزان**[1] / hozan/: ناو. ١. پارچە شیعرێک ٢. هەستیار؛ شاعیر ⚑ ١. قطعه شعر ٢. شاعر

**هۆزان**[2]: ئاوەڵناو. ١. زۆر زانا ٢. پسپۆڕ ⚑ ١. دانشمند ٢. مُتخصص

**هۆزانڤان** / hozanvan/: ناو. ١. شاعیر؛ بویژ ٢. کەسێ کە شیعری خەڵک بە گۆرانی دەڵێ ⚑ ١. شاعر ٢. خوانندەی اشعار دیگران

**هۆزانی** / hozanî/: ناو. زانایۆخی؛ زۆرزانی ⚑ دانشمندی

**هۆزۆر** / hozor/: ☜ هەزار

**هۆزەڕۆ** / hozeřo/: ناو. گیایەکە ⚑ گیاهی است

**هۆزەلاو** / hozelaw/: ☜ هۆزەڵان

**هۆزەڵان** / hozełan/: ناو. هۆزەلاو؛ گیایەکی خواردنییە ⚑ گیاهی خوردنی

**هۆزی** / hozî/: ناو. ١. گای دەبەء؛ گای یەختەنەکراو ‹وەک هۆزی ملی هەڵدێنێ و دەکەوێتە نێو گاران› ٢. *[کنایە]* پیاوی تولاز ⚑ ١. گاو اخته نشده ٢. مرد هیز

**هۆژان** / hojan/: چاوگ. هۆژین؛ هەڤۆتن؛ فێر بوون؛ ڕاهاتن ⚑ آموختن

**هۆژاندن** / hojandin/: چاوگ. فێر کردن؛ ڕاهێنان؛ هین کردن ⚑ تعلیم دادن

**هۆژاندی** / hojandî/: ئاوەڵناو. فێر؛ ڕاهاتوو ⚑ آموزش دیده

**هۆژین** / hojîn/: ☜ هۆژان

**هۆسا**[1] / hosa/: ☜ وەستا

**هۆسا**[2]: ئاوەڵکار. وسا؛ ئاوا؛ ئاوها ⚑ این‌طور

**هۆسار** / hosar/: ☜ هەوسار

**هۆست** / host/: ئامراز. ئالی؛ لا؛ نک؛ کن؛ جەم ⚑ نزدِ

**هۆستا** / hosta/: ☜ وەستا

**هۆستاکار** / hostakar/: ☜ وەستاکار

**هۆستایی** / hostayî/: ☜ وەستایی[1]

**هۆستە** / hoste/: ☜ وەستا

**هۆسە** / hose/: ناو. ماسە؛ ڕەمڵ ⚑ ماسه

**هۆسین** / hosîn/: ☜ **هەسون**[1]

**هۆش**[1] / hoş/: ناو. هش؛ بیر ‹بە غایب بوونی ئەو باوکی فەقیر و خادیمی قەومە/ لە سەر هۆش و لە دل سەبر و لە تەن تاب و تەوان ڕۆیی «بێخود»› ☰ هوش

⊡ **هۆش پێوەبون**: ئاگادار بوون؛ چاودێری شتێ/ کەسێک بوون ☰ مواظب بودن

**هۆش هاتنەوە بەر**: هاتنەوە سەر خۆ ‹لام وایە ماوەی دە دەقیقەیەک تاسام ... لەپڕ هۆشم هاتەوە بەر: هەیاران! من نزیکەی سی ساڵە دەژیم، ژیان هەر ئەو شەڕەشەق و کەربازاڕەیە کە دیومە ... «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ بە خود آمدن

**لە هۆش چون**: ١. بێهۆش بوون؛ بوورانەوە ‹چاوی بە خوێنەکە کەوت لە هۆش چوو› ٢. لە بیر چوون ‹لە هۆشم چوو نان بسێنم› ☰ ١. بیهوش شدن ٢. فراموش کردن

**لە هۆش بردنەوە**: بوونە هۆی فەرامۆش بوون ☰ موجب فراموشی شدن

**خستنە هۆش**: وە بیر هێنانەوە ☰ بە یاد انداختن

**هۆش**[2]: ئاوەڵناو. دم و چاو بەڵەکی ڕەش و سپی (بزن) ☰ صورت خلنگی (بُز)

**هۆش**[3]: دەنگ. وۆش؛ وتەی ڕاوەستاندنی کەر ☰ هُش

**هۆشتر** / hoştir/: ☜ **وشتر**

**هۆشنگ** / hoşing/: ناو. هەتیو؛ سێوی بێباف؛ باوک مردوو ☰ یتیم

**هۆشە** / hoşe/: ناو. ١. ☜ **هێشوو** ٢. هەستی ئەندام ‹هۆشەی بۆ کردنی نییە› ☰ ١. ☜ **هێشوو** ٢. حس

**هۆشەچن** / hoşeçin/: ناو. هۆشەچە؛ هێشووگەر؛ گوڵچین ☰ خوشەچین

**هۆشەچە** / hoşeçe/: ☜ **هۆشەچن**

**هۆشەکاری** / hoşekarî/: ناو. کار و ڕەوتی خۆ هەڵکێشان؛ پەسنی خۆ دان ☰ خودستایی

**هۆشەکانێ** / hoşekanê/: ناو. جۆلانە؛ جۆلانێ ☰ تاب

**هۆشیار** / hoşyar/: ☜ **هوشیار**

⊡ **هۆشیار بونەوە**: ☜ **هوشیار بونەوە**

**هۆشیاری** / hoşyarî/: ☜ **هوشیاری**

**هۆفاڵ** / hofał/: ئاوەڵناو. درۆزن؛ درۆباز ☰ دروغگو

**هۆفە** / hofe/: ناو. ڕوومەت؛ کاری گەندەموو لە دەموچاو لابردن ☰ موچینی از رُخسار

**هۆڤ** / hov/: ئاوەڵناو. ١. کێوی؛ دڕندە ٢. چەقاڵتە (گۆشت) ٣. ترسێنەر؛ پیاوتۆقێن ‹خوە ژ وان هۆڤان دوور بخە› ٤. زلحۆرت؛ زەبەلاحی ملهوڕی هیچ لە دنیا نەزان ☰ ١. وحشی ٢. پر رگ و پی (گوشت) ٣. مخوف؛ ترسناک ٤. یاردانقلی

**هۆڤا** / hova/: جێناو. هۆ ئەوێ؛ هێمایە بۆ دوور ☰ آنجا

**هۆڤک** / hovik/: ناو. ١. ئاژەڵ و گیانەوەری دڕندە ٢. /کنایە/ مرۆی بێبەزە و وەحشی ☰ ١و٢. وحشی

**هۆڤەبەر**[1] / hoveber/: ئاوەڵناو. ١. لەخۆبایی؛ لووتبەرز ٢. ناکەس؛ نزم و نامەرد ☰ ١. مُتکبر ٢. پست

**هۆڤەبەر**[2]: ئاوەڵکار. دڕندانە؛ وەحشیانە ☰ وحشیانه

**هۆڤی** / hovî/: ئاوەڵناو. کێوی؛ وەحشی؛ هۆڤ ☰ وحشی

**هۆڤیتی** / hovîtî/: ☜ **هۆڤینی**

**هۆڤینی** / hovînî/: ناو. /کنایە/ هۆڤیتی؛ دڕندەیی ☰ وحشیگری

**هۆڤێتی** / hovêtî/: ناو. کۆڤێتی؛ دڕندەیی؛ کردەوەی پێچەوانەی نەریتی ژیار ☰ توحش؛ وحشیگری

**هۆق**[1] / hoq/: ناو. ڕەوتی ڕشانەوە؛ هەڵهاوردنەوە ☰

قی

**هۆق**[٢]: دەنگەناو. ١. دەنگی گەروو لە ڕشانەوەدا ٢. ☜ **هۆقە**[٢] ☰ ١. عُق ٢. ☜ **هۆقە**[٢]

**هۆقاندن / hoqandin/**: چاوگ. ١. جۆرە دەنگ هەڵبڕینێکە وەک دەنگی گامێشێ ٢. ڕشانەوە؛ هەڵهاوردنەوە ☰ ١. ماغ کشیدن ٢. قی کردن

**هۆقە**[١] **/ hoqe/**: ناو. حۆقە: ١. وەقە؛ سەنگێکە بۆ شت پێ کێشان ‹ئەگەر لە فەیزی ئەو نەبێ دوو هۆقە جۆ و یەک چتیر/ چلۆن لە ڕۆژی خەندەقا کیفایەتی هەزار ئەکا؟! «بێخود»› ٢. فێڵ و تەڵەکە ☰ ١. اوقیه؛ وزنی است ٢. حُقّه؛ نیرنگ

**هۆقە**[٢]: دەنگەناو. هۆق؛ دەنگی گامێش ☰ ماغ گاومیش

**هۆقەباز / hoqebaz/**: ئاوەڵناو. هەقەباز؛ فێڵباز؛ دەسبڕ ☰ حُقّەباز

**هۆک**[١] **/ hok/**: ناو. ١. تاسە؛ ئارەزوو ٢. *[شوورەیی]* با؛ ئیشتیای گان ٣. گە؛ مان ٤. نۆهک؛ نخە؛ نۆک ٥. کاری ڕاهی کردن؛ کردنەوەی گرێ و شتی دژوار و ئاڵۆز ٦. هێک؛ هێلکە؛ هاک ٧. کونج؛ قوژبن؛ گۆشە ٨. بیانوو بۆ خۆ لە کار دزینەوە ٩. قار؛ دۆخی تۆران ☰ ١. آرزو ٢. هوس جماع ٣. اعتصاب ۴. نخود ۵. گره گشایی ۶. تخم‌مرغ ۷. گوشه ۸. بهانه برای تنبلی ۹. قهر

⊡ **هۆک کردن**: مان گرتن؛ گە گرتن ☰ اعتصاب کردن

**هۆک گرتن**: ١. قار کردن؛ تۆران ٢. بیانوو گرتن ‹بە خۆڕایی لە مەحوی بەس بڕەنجە/ نەجیبی، مەگرە وەک هۆکڵ، بەگم! هۆک «مەحوی»› ☰ ١. قهر کردن ٢. بهانه گرفتن

**هۆک**[٢]: ئاوەڵناو. هووک؛ هێدی؛ بێ سەختی، توندی یان تەوژم ☰ نرم و مُلایم

**هۆکار / hokar/**: ناو. هۆ؛ بۆنە؛ کەس یان شتێ کە دەبێتە هۆی کارێک ‹هۆکاری سەرەکی ئەم شەڕە، پارە و دەسەلاتە› ☰ علّت

**هۆکارە / hokare/**: ئاوەڵناو. گیرۆدە؛ ئالوودە ☰ معتاد

**هۆکاوی / hokawî/**: ئاوەڵناو. سێکسی؛ بزوێنەری ئارەزووی جنسی ☰ سکسی

**هۆکرد / hokird/**: ناو. بەرهۆ؛ شۆنهات؛ بەرهەمی هۆ ‹ئەم هەموو ماڵوێرانییە هۆکردی شەڕە› ☰ معلول

**هۆکڵ**[١] **/ hokił/**: ناو. نۆکەر؛ غولام؛ پیاوی بەردەست ☰ نوکر

**هۆکڵ**[٢]: ئاوەڵناو. بیانووگر؛ گرووگر ‹بە خۆڕایی لە مەحوی بەس بڕەنجە/ نەجیبی، مەگرە وەک هۆکڵ، بەگم! هۆک «مەحوی»› ☰ بهانه‌گیر

**هۆکن / hokin/**: ئاوەڵناو. گەگر؛ مانگر ☰ مُتحصن

**هۆکەک / hokek/**: ↓

⊡ **هۆکەک کەروش**: ١. ئەم بەر ئەو بەرکردن لە ڕێگەچووندا ٢. بە ڕێگەی پڕ خوارەکە و پێچەکەدا ڕۆیشتن ☰ ١. بە شکل مارپیچ راه رفتن ٢. از راه پر پیچ و خم عبور کردن

**هۆکەڵ / hokeł/**: ئاوەڵناو. هەڵکەوتە؛ بلیمەت ☰ نابغه

**هۆکی**[١] **/ hokî/**: ناو. ١. کاشۆبازی؛ شەقێنی بە سواری ٢. گۆی کاشۆبازی ☰ ١. چوگان ٢. گوی چوگان

**هۆکی**[٢]: ئاوەڵناو. وازوازی؛ دەمدەمی ☰ دمدمی

**هۆکیهۆکی / hokîhokî/**: ئاوەڵناو. حولحولیمەزەو؛ عەنتەرمەزاج؛ هەردەم لە سەر مەزاجێ ☰ دمدمی‌مزاج

**هۆکێ / hokê/**: ئاوەڵناو. *[شوورەیی]* زەنەک؛ شاوەتی؛ تۆلاز ☰ شهوتران

**هۆگاڵە / hogałe/**: ناو. هەراو هوریا ☰ سروصدا

**هۆگان / hogan/**: ناو. خەتی جووت لەم سەر تا ئەو سەر ‹هۆگانە جووتێ درێژە› ☰ درازای شیار شخم

**هۆگج / hogic/**: ناو. **هۆگچ؛ هۆگەچ**؛ بەرانی داشت؛ بەرانی مەڕتێبەردان ☰ قوچ

**هۆگچ / hogiç/**: ناو. ١. شەکبەرانی دوو ساڵە ٢. ☜ **هۆگج** ☰ ١. قوچ دوساله ٢. ☜ **هۆگج**

**هۆگر[1] / hogir/**: ناو. خوو؛ عادەت ‹هۆگری گرتووە› ☰ عادت؛ انس

▣ **هۆگر گرتن:** خووگرتوو بوون؛ عادەت کردن ‹ڕاست یان درۆ بە خۆشەویستی ئەوانەوە هۆگرم گرتووە و زۆری پێ شادم. «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ انس گرفتن

**هۆگر[2]**: ناوەڵناو. ١. فێرەک؛ متۆ؛ خووگرتوو ‹ڕۆڵە: تۆ ئەم بەرخەت بۆچی خۆش ئەوێ؟/ ـ بارەی خۆشە و هۆگرمە و دووم ئەکەوێ «پیرەمێرد»› ٢. حەزۆک؛ پابەند یان دڵبەستەی شتێ ‹ئاغاکەم زۆر هۆگری متالا کردن بوو، تەنانەت کە دەچووە سەر پێشاویش شتێکی دەبرد لەوێ بیخوێنێتەوە! «هەژار، چێشتی مجێور»› ٣. ئۆگر؛ لایەنگر و شوێنکەوتووی کەس یان بەرنامەیەک ‹تاکەی ئەوندە هۆگری چەوتی و خراپە بوون؟/ تاکەی ئەوندە تالیبی ناڕاستی و درۆن؟ «ڕەمزی سلێمانی»›. هەروەها: **هۆگر بوون** ☰ ١. مأنوس ٢. علاقەمند ٣. هوادار

**هۆگری / hog(i)rî/**: ناو. ئۆگری؛ لایەنگری؛ دۆخی دڵ بە لای شتێکەوە بوون. هەروەها: **هۆگری کردن** ☰ علاقەمندی

**هۆگە / hoge/**: ☜ **هۆجەنە**

**هۆگەچ[1] / hogeç/**: ☜ **هۆگج**

**هۆگەچ[2]**: ناوەڵناو. دژ؛ بەرهەڵست ☰ ضد؛ مُعارض

**هۆڵ[1] / hol/**: ناو. ١. مژ و کرێوە ٢. مەیدانی شەقێن و گۆبازی ٣. گۆی شەقێن ‹پێخواس هنەکهنەک و سەرکۆل/ کاشۆ ژ پیان و سەر وەکی هۆل «خانی»› ٤. گوڕە و زەنا ـ زەنا ٥. کەللا؛ هەڵمات ٦. مزراق؛ مەزرێخ ٧. تەلەسەنگ؛ بەردی زل ٨. بەرزایی؛ بڵندایی ٩. ☜ **هۆڵە** ١٠. هۆل؛ هاڵ؛ ژووری گەورە ☰ ١. مه و کولاک ٢. میدان چوگان‌بازی ٣. گوی چوگان ۴. سروصدا ۵. تیله ۶. گردنا ۷. خرسنگ ۸. بلندی ۹. ☜ **هۆڵە** ۱۰. سالن

▣ **هۆڵ کەردش:** گێرە کردن ☰ خرمن کوبیدن

**هۆڵ[2]**: ناوەڵناو. ١. ☜ **حۆڵ** ٢. چاک؛ هێژا ٣. ئازا؛ نەترس ☰ ١. ☜ **حۆڵ** ٢. خوب ٣. شجاع

**هۆڵ[3]**: دەنگەناو. ١. دەنگی باریکی گا ٢. دەنگی گوێرەکە ☰ ١. صدای نازک گاو ٢. صدای گوساله

**هۆڵ[4]**: پێرۆ. ← **چۆڵوهۆڵ**

**هۆڵئایاک / hol'ayak/**: ناوەڵناو. هەرەچاک؛ باشترین ☰ بهترین

**هۆلارە / holare/**: ناو. شەڵتەی کوندە ئاو پێ کێشان ☰ گاله‌ی خیگ آبکشی

**هۆلاسەری / holaserî/**: ناو. کایەیەکی منداڵانەیە ☰ از بازی‌های کودکانه

**هۆلان / holan/**: ☜ **هۆلێن**

**هۆلاندن / holandin/**: چاوگ. ١. بۆڕاندن؛ قۆڕاندن؛ هۆڕاندنی گا ٢. دەنگ هەڵێنانی درێژی گوێرەکە ☰ ١. ماغ کشیدن گاو ٢. صدا کردن گوساله

**هۆلانە / holane/**: ناو. گەمەی گۆیێن ☰ گوی بازی

**هۆلدان / holdan/**: ناو. *[کینایە]* هۆلمان: ١. ورگ؛ زگ؛ سک ٢. ئوور؛ هۆلمان؛ گەدە ☰ ١. شکم ٢. معده

**هۆلس / hols/**: ناوەڵناو. ئارانشین؛ دژی کۆچەر ☰ یکجانشین

**هۆلک / hol(i)k/**: ناو. ١. کوخ؛ خانووی چکۆلە لە دەشت ٢. کەپر؛ کەپرە؛ هەرزاڵ ☰ ١. کوخ ٢. کَپَر

**هۆللک / hollik/**: ناو. حەشارگەی ڕاوچی ☰ کمینگاه شکارچی

**هۆلمان** / holman/: ☜ **هۆلدان**

**هۆلە**[١] / hole/: ☜ **هۆلە**

**هۆلە**[٢]: دەنگەناو. دەنگی بانگ کردن یان لێخوڕینی گوێرەکە ☰ صدای خواندن یا راندن گوساله

**هۆلەهۆل** / holehol/: دەنگەناو. ١. هۆلەی یەک لە دوای یەک ٢. دەنگی تێکەڵ بە گریان ☰ ١. صدای پیاپی گوساله ٢. صدای گریان

**هۆلی** / holî/: ناو. ١. هۆل؛ جاش و جانووی ئێکساڵە ٢. گێژی؛ دەبەنگی؛ حۆلی ٣. ☜ **هۆلە** ٤. تۆپتاو؛ شاکۆن؛ گۆچانی گۆبازی ☰ ١. کُرّەی یکساله ٢. هالویی ٣. ☜ **هۆلە** ۴. چوگان

◻ **هۆلی کرن**: گێرە کردن ☰ خرمن کوبیدن

**هۆلیکری** / holîk(i)rî/: ئاوەڵناو. گێرەکراو (خەرمان) ☰ کوبیده (خرمن)

**هۆلین** / holîn/: چاوگ. هەرا و زەنا کردن؛ قوولە کردن ☰ غریو راه انداختن

**هۆلێ** / holê/: ئاوەڵناو. ئاوها؛ ئەئاوا؛ بەمجۆرە ‹ئەو خەبەر نە هۆلێیە› ☰ این طور

**هۆلێر** / holêr/: ناو. دارشۆخ؛ دارقەڵەم؛ چنار ☰ تبریزی

**هۆلێن** / holên/: ناو. هۆلان؛ هۆلێن؛ هوولان؛ شەقێن؛ کاشۆبازی؛ گۆیێن؛ وەرزشێکی گرۆیی، یاریکەرانی لە سەر ئەسپ بە گۆچان لە گۆی دەدەن تا بچێتە نێو دەروازەوە ☰ چوگان‌بازی

**هۆڵ**[١] / hoł/: ناو. ١. ئاغەڵی پەز ‹گەڕان کێو و چیا و ئەشکەوت و زەندۆڵ/ گەڕان کادێن و کەندوو، ئاخوڕ و هۆڵ «هێمن»› ٢. ژووری گەورە لەماڵدا ٣. تالار؛ ژووری گەورەی جێ کۆبوونەوە ‹هۆڵی مێدیا لە شاری هەولێر› ٤. جاش و جانووی یەکساڵە ☰ ١. آغُل ٢. هال؛ سرسرا ٣. سالن ۴. کُرّەی یکساله

**هۆڵ**[٢]: پێرو. ← **چۆڵوهۆڵ**

**هۆڵنج** / hołinc/: ☜ **هێڵنج**

**هۆڵۆشە** / hołoşe/: ناو. پیرخەنیلە؛ برۆشی ساوار ☰ ریزەی بلغور

**هۆڵە** / hołe/: ناو. هۆل؛ هۆلە؛ هۆلی؛ گێرە؛ کار و ڕەوتی کوتانی خەرمان. هەروەها: **هۆڵە کردن** ☰ خرمنکوبی

**هۆڵەمەڕ** / hołemeř/: ناو. گۆف؛ هەڵ؛ ئاغەڵ ☰ آغُل

**هۆڵی** / hołî/: ناو. جاشک و جانوو ☰ کُرّەی الاغ و مادیان

**هۆڵیکەر** / hołîker/: ناو. کوڕە؛ جاش؛ بێچووی کەر ☰ کُرّەالاغ

**هۆڵێن** / hołên/: ☜ **هۆلێن**

**هۆم** / hom/: ناو. سنوور؛ کەوشەن ☰ مرز

**هۆما** / homa/: ناو. هۆمان؛ هۆمای؛ هووما؛ هوومای؛ خودا؛ خوا ☰ خدا

**هۆمار** / homar/: ☜ **هەمار**

**هۆمارتش** / homartiş/: چاوگ. ژماردن؛ بژاردن ☰ شُمُردن

**هۆمام** / homam/: ئاوەڵناو. دەسەلاتدار؛ خاوەن دەسەلات ☰ مُقتدر

**هۆمان** / homan/: ☜ **هۆما**

**هۆمانوەری** / homanwerî/: ناو. پیرۆزی؛ موبارەکی ☰ مبارکی

**هۆمای** / homay/: ☜ **هۆما**

**هۆمایی** / homayî/: ئاوەڵناو. تایبەتی؛ خۆماڵی ☰ مخصوص

**هۆمبی** / hombî/: ناو. شووبراژن؛ هێوەرژن؛ براژنی مێرد ☰ جاری؛ زن برادر شوهر

**هۆمدەم** / homdem/: ☜ **هاودەم**

**هۆمڕیش** / homřîş/: ☜ **هاوڕیش**

**هۆملکێ** / homilkê/: ناو. بەربەرەکانێ؛ کاری دە گژ یەک ڕا چوونەوە ☰ رویارویی

**هۆمەلێرە** / homelêre/: ناو. دیزەی گۆشتاو تێدا لێنان ☰ دیزی آبگوشت

**هۆمەڵغەزا / homełğeza/**: ناو. چەقەو گوڕە و زەنازەنای بە کۆمەڵ ☰ همهمه

**هۆمەن / homen/**: ☜ هەڵمەت ـ١

**هۆمەیی / homeyî/**: ئاوەڵناو. بۆری تاریک (پەز) ☰ طوسی رنگ تیره (گوسفند)

**هۆمەییش / homeyîş/**: چاوگ. لە کۆ کردنەوەی تفاق بوونەوە ☰ تمام شدن کار جمعآوری علوفه

**هۆن[١] / hon/**: ناو. ١. خەتی زەوی بۆ ئاو پێدا چوون ٢. خەو؛ خەون ☰ ١. شیار آبیاری در زمین ٢. رؤیا

**هۆن[٢]**: ☜ هەوە[٢]

**• هۆن[٣]**: پاشوشە. ١. وەهۆن ‹پاڵەی سواڵەهۆنی بەگورد/ چقلی چاوی دژمنی کورد «هێمن»› ٢. وەند ‹دەزووهۆن› ٣. ـ چن ‹گۆرەویهۆن› ☰ ١. ـ بند ٢. ـ ریس ٣. ـ باف

**هۆنا / hona/**: ☜ هێشتا

**هۆناس / honas/**: ناو. سەرپاڵەی دروێنە ☰ سردستهی دروگران

**هۆنان / honan/**: چاوگ. هۆنای: ١. تەنین؛ چنین ٢. *[مەجاز]* بنیات نانی دام و دزەگای میری یان بازرگانی ☰ ١. بافتن ٢. تشکیل دادن سازمان

**هۆناندن / honandin/**: چاوگ. وەندن؛ تەنین ☰ بافتن

**هۆنانەوە / honanewe/**: ☜ هۆندنەوە

**هۆنای / honay/**: ☜ هۆنان

**هۆندران / hond(i)ran/**: ☜ هۆنران

**هۆندراو / hond(i)raw/**: ☜ هۆنراوە[٢]

**هۆندراوە / hond(i)rawe/**: ☜ هۆنراوە[٢]

**هۆندک / hondik/**: ☜ هندك

**هۆندن / hondin/**: ☜ هۆندنەوە

**هۆندنەوە / hond(i)newe/**: چاوگ. تێپەر. //هۆندتەوە؛ دەهۆنییەوە؛ بهۆنەوە// وەندن؛ وەندنەوە؛ وەنین؛ هۆنانەوە؛ هۆندن؛ هۆنەوە؛ هۆنین؛ هۆنینەوە: ١. داوی زۆری بادراو تێک کێشان ‹گوریس هۆندنەوە› ٢. شتێ دە داو یان ڕیزێ کێشان ‹تەزبێح هۆندنەوە› ٣. هەڵبەست گوتن ‹بۆنی ڕزگاریت لە شیعری دێ، چ جوانت هۆندەوە/ ئەی هەژار! ئەی شاعیری تێکۆشەری ناوداری کورد! «هێمن»› ☰ ١. بافتن (ریسمان) ٢. به رشته کشیدن ٣. سرودن؛ به نظم درآوردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـــ/ چاوگی نەرێنی: نەهۆندنەوە

**هۆندۆری / hondorî/**: ئاوەڵناو. دەروونی ☰ درونی

**هۆندە / honde/**: ئاوەڵکار. ١. هێندە؛ ئەوەندە ٢. پتر؛ زیاتر ☰ ١. اینقدر ٢. بیشتر

**هۆندەکە / hondeke/**: ☜ هندك

**هۆنران / honran/**: چاوگ. تێنەپەر. نادیار. //هۆنرای؛ دەهۆنرێی؛ بهۆنرێ// هۆندران: ١. بە ڕیز بەسترانی شتێ ٢. بە بەنەوە کران؛ دە داو یان ڕیزێ کێشران ٣. کرانە هۆنراوە ☰ ١. بافته شدن ٢. به رشته کشیده شدن ٣. به نظم درآورده شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: هۆنراو/ چاوگی نەرێنی: نەهۆنران

**هۆنراو / honraw/**: ☜ هۆنراوە[٢]

**هۆنراوە[١] / honrawe/**: ناو. هەڵبەست؛ هۆنە: ١. شیعر؛ وتەیێ کە کێش، بەشاوەند و واتایەکی ڕازاوەی هەیە ٢. *[کینایە]* بە شیعر گوتراو؛ وتەی کێشدار ☰ ١. شعر ٢. کلام منظوم

**هۆنراوە[٢]**: ئاوەڵناو. هۆندراو؛ هۆندراوە؛ هۆنراو: ١. (داوی) بە یەکەوە بادراوی تێکهەڵکشاو ٢. (دەنکە مووروی) بە بەنەوەکراو ☰ ١. به هم بافته ٢. به رشته کشیده شده

**هۆنراوەیی / honraweyî/**: ئاوەڵناو. شیعری؛ پێوەندیدار لەگەڵ شیعر یان سەر بە شیعر ☰ شعری

**هۆنقەراس** / honqeras/: ئاوەڵکار. هانقاس؛ ئەوهەندە؛ ئەم ئەندازەیە ☷ این اندازه

**هۆنک** / honik/: ☜ **هێنك**

▣ **هۆنک با**: بایەکە لە باکووری خۆرهەڵاتەوە دێ ☷ باد شمال شرقی

**هۆنکاندن** / honkandin/: چاوگ. هێورکردنەوە ☷ آرام کردن

**هۆنگۆ** / hongo/: ☜ **ئەنگۆ**

**هۆنن** / honin/: چاوگ. خوێندن ☷ خواندن

**هۆننەوە** / honnewe/: ☜ **هۆندنەوە**

**هۆنە** / hone/: ناو. ١. پرچی هۆندراو ٢. موورووی هۆندراو ٣. ئاکار؛ نیشانە؛ نیشانەی باشی ‹هۆنەی میرانەیە› ٤. هەڵبەست؛ بەرانبەری پەخشان ٥. نەسیم؛ شنە ☷ ١. موی بافته ٢. مُهرەی بە رشته کشیده ٣. نشانەی خوبی ۴. نظم ۵. نسیم

**هۆنەر** / honer/: ناو. ١. کەسێ کە دەهۆنێتەوە (بەگشتی) ٢. *[کینایە]* شاعیر ☷ ١. بافنده (عام) ٢. شاعر

**هۆنەهۆن** / honehon/: دەنگەناو. گریانی سەبری بێبڕانەوە ☷ گریەی آهستەی بدون انقطاع

**هۆنەهۆنە**[1] / honehone/: ☜ **هۆنهۆن**

**هۆنە ـ هۆنە**[2]: ئاوەڵکار. بە ڕیز؛ یەک لە دووی یەک ‹هۆنە ـ هۆنە فرمێسکی دەهاتە خوار› ☷ متوالی

**هۆنەیی** / honeyî/: ئاوەڵکار. ئاوەها؛ بەمتەرزە ☷ اینطور

**هۆنهۆن**[1] / honhon/: ناو. هۆنەهۆنە؛ چۆنیەتی فرمێسک داوەرینی بە شوێن یەکدا ‹شیعرەکانم گەلێ جاریش پەستن، ئەگرین/ هۆنهۆن فرمێسک هەڵئەڕێژن «شێرکۆ»› ☷ زارزار

**هۆنهۆن**[2]: دەنگەناو. هۆنەهۆنە: ١. گریانی سەبری بێبڕانەوە ٢. دەنگی گێژاو ☷ ١. گریەی آهستەی بدون انقطاع ٢. صدای گرداب

**هۆنیای** / honyay/: چاوگ. هۆنران ‹هۆنیای زەنگیانەی زوڵفانت پەی کێن/ چین ـ چین ئەگریجەی کولمانت پەی کێن «عەبدولوەهاب ئاریانی»› ☷ بافته شدن

**هۆنین** / honîn/: ☜ **هۆندنەوە**

**هۆنینەوە** / honînewe/: ☜ **هۆندنەوە**

**هۆو**[1] / how/: ئاوەڵناو. ئەو، بۆ دوور ‹هۆو کابرا کێیە بەرەو ئێرە دێ؟› ☷ آن

**هۆو**[2]: دەنگ. بەڵێ؛ ها ☷ بلی

**هۆوا** / howa/: جێناو. هۆ ئەو جێیە؛ هێمایە بۆ دوور ☷ آنجا

**هۆوت** / howit/: ☜ **حەوت**

**هۆوتای** / howitay/: ☜ **حەفتا**

**هۆورە** / how(i)re/: ناو. هۆوەرە؛ زڕەچرگ ☷ هوبره

**هۆوز** / howiz/: ناو. ١. سەوز؛ کەسک ٢. ☜ **حەوز** ☷ ١. سبز ٢. ☜ **حەوز**

**هۆوسار** / how(i)sar/: ☜ **هەوسار**

**هۆوق** / howiq/: ناو. هەوق؛ تاق؛ تاقی گومبەز ☷ سقف گنبد

**هۆول** / howil/: ئاوەڵناو. ١. هەول؛ باش ٢. ئازا؛ نەترس ☷ ١. خوب ٢. شُجاع

**هۆون** / howin/: ناو. خەو؛ خەون ☷ خواب

**هۆوە** / howe/: جێناو. هۆوها؛ ئەو شتەی لە بەر چاوە و دوورە ☷ آن چیز

**هۆوەرە**[1] / howere/: ☜ **هۆورە**

**هۆوەرە**[2]: دەنگ. بانگی جووتیار لە گا جووت ‹چ خۆشە دەنگی باللۆرە/ چ خۆشە هۆوەرەی جووتیار «هێمن»› ☷ هَی هدایت گاو شخمزن

**هۆوەندە** / howende/: جێناو. وەڤەر؛ ئەو شوێنە دوورە ☷ آن دوردست

**هۆوەنەییش** / howeneyîş/: چاوگ. ڕوانین؛ تواشا کردن؛ لێ مەیزاندن ☷ نگاه کردن

**هۆوها** / how(i)ha/: ☜ **هۆوە**

**هۆوی / howî/**: ناو. مالۆس؛ بەرازی مێو ☰ گُراز ماده

**هۆوێ / howê/**: جێناو. ئەویا؛ وەت؛ ئەوێ ☰ آنجا

**هۆ . هۆ / hoho/**: دەنگ. ١. وتەی جووتیار لە گاجووت لێخوڕیندا ٢. وشەی بانگ کردنی مێگەل ٣. دەنگی بانگ کردنی کەسێ لە دوورەوە ‹هۆ ـ هۆ ئارام!› ٤. وتەی سەیرمان و باوەڕ نەکردن ‹هۆ ـ هۆ ئەوە تۆ دەڵێی چی؟› ☰ ١. هَی هدایت گاو شخم‌زن ٢. کلمەی خواندن گله ٣. حرف ندای از دور ۴. واژەی تعجب و ناباوری

**هۆی[1] / hoy/**: ناو. گرێو؛ مەرج ☰ شرط

**هۆی[2]**: دەنگ. وتەی بانگ کردنی لە دوور ☰ حرف ندای از دور

**هۆیاندن / hoyandin/**: چاوگ. گرێو کردن؛ مەرج دانان؛ مەرج بەستن؛ گرۆ کردن ☰ شرط بستن

**هو[1] / hû/**: ناو. ١. خودا؛ خودێ؛ خوا ٢. قازانج؛ سوود ٣. پف بۆ گەرم کردنەوە. هەروەها: **هوو کردن** ☰ ١. خُدا ٢. سود ٣. ها

⊡ **هو لە مو جیا کردنەوە:** *[کنایە]* وردبینی و شوێنگری زۆر و لە ڕادە بە دەر دەکار کردن ☰ مو را از ماست کشیدن

**هو[2]**: ئاوەڵناو. بێ‌نرخ؛ هیچ و پووچ ☰ پوچ و بی‌ارزش

**هو[3]**: دەنگ. ١. هەرای دەروێشان ‹بە جۆش و خرۆش، یا هوو یا من هوو/ مەلیکەی دەریای هێنایە بەر ڕوو «پیرەمێرد»› ٢. دەنگی بڕێتی لە وەڕەز بوون ☰ ١. هو ٢. وا

**هوت[1] / hût/**: ناو. ١. خەو؛ خەون ٢. هەفۆت؛ فێرکاری ٣. چێژە/ تامی خۆش ٤. شەیتان؛ گیانی بەدفەڕ ٥. شە؛ تەڕایی ☰ ١. خواب ٢. آموزش ٣. مزەی مطبوع ۴. روح شریر ۵. نم؛ رطوبت

⊡ **هوت ئانتش:** شە کێشان؛ ڕتووبەت کێشان ☰ نم کشیدن

**هوت بون:** ١. فێر بوون؛ هین بوون؛ هەفۆتن ٢. ئالوودەی شت یان شوێنێک بوون ☰ ١. یاد گرفتن ٢. به چیز یا جایی مُعتاد شدن

**هوت کرن:** پێ فێر بون؛ هووت بوون ☰ عادت کردن

**هوت[2]**: پێرۆ. ← **هات‌وهوت**

**هوتک / hûtik/**: ناو. نووکی تیژی بە هەسان و بەردەزوورە سواو ☰ نوک تیز شده به وسیلەی سوهان

**هوتە / hûte/**: ناو. خەو ☰ خواب

**هوچک / hûçik/**: ناو. ١. ☜ **ئەنگوچك** ٢. ئاتەگ؛ خوارەوەی داوێن ٣. قۆڵی کراس ☰ ١. ☜ **ئەنگوچك** ٢. پایین دامن ٣. آستین پیراهن

**هود[1] / hûd/**: ناو. ١. دەسڕۆیی؛ دەسەڵات؛ زاکوون؛ زەبر و زەنگی لە حوکم کردنا ٢. دەفری لە سواڵەت ٣. دەوری و دەفری پەل لە سواڵەت؛ گلێنەی پەل ٤. شکاوی؛ شکیاگی ٥. هەوابەر؛ کەرستەیەک بە سەر کوانوو یان ئوجاقەوە بۆ هەڵکێشان و دەرکردنی هەڵم و بۆق و چڕ و چەوری نێو چێشتخانە ☰ ١. اقتدار ٢. ظرف سُفالین ٣. بُشقاب سُفالی ۴. شکستگی ۵. هود

**هود[2]**: ئاوەڵناو. ١. دووتۆمە؛ دووڕەگە؛ دووڕە ٢. شکاو؛ شکیاگ ☰ ١. دورگه ٢. شکسته

**هودەرە / hûdere/**: ناو. هوووەرە؛ چێرگ؛ چرگ؛ مێشەسی ☰ هوبره

**هور[1] / hûr/**: ناو. ١. ورگ؛ عوور ٢. بیر؛ ویر؛ یاد؛ یای ☰ ١. معده ٢. یاد

**هور[2]**: ☜ **هورد**

⊡ **هور بون:** هوور بین: ١. ورد بوون ٢. نەرم بوون ☰ ١. خُرد شدن ٢. نرم شدن

**هور بونەوە:** لێ ورد بوونەوە؛ بە وردی لێ ڕوانین؛ باش هۆش دانە سەر ☰ دقت کردن

**هور بین:** ☜ **هور بون**

**هور کردن:** ١. ورد کردن ‹فێ پەرەی بۆ من هوور

کە!› ٢. لەت لەت کردن؛ پارچە پارچە کـردن ‹سەبر و قەرارم کۆ بر/ جان و جەگـەر هـوور دکـر «مەلای جزیری»› 🇮🇷 خُرد کردن

**هوراندن** / hûrandin/: چـاوگ. ١. ورد کـردن؛ هارین ‹د دەستارێن ساقارێ دە تێن هووراندن› ٢. چکۆلـە کردنـەوەی زەلام ٣. *[کینایە]* تۆژینـەوە؛ کۆڵینەوە؛ بە وردی بـیر لـێ‌کردنـەوە 🇮🇷 ١. خُـرد کردن ٢. کوچک کردن ٣. پژوهیدن

**هووربژار** / hûrb(i)jar/: ئاوەڵناو. ئالەبێژ 🇮🇷 بیختە یا پارچە

⊡ **هووربژار کردن**: ئالەبێژ کردن؛ بە هێڵـەگی زۆر کـون‌ورد یـان بـە پارچـە قوماشـێک، هەڵـە دابێژتن 🇮🇷 بیختن

**هووربین**[١] / hûrbîn/: ناو. وردبین 🇮🇷 میکروسکوپ

**هووربین**[٢]: ئاوەڵناو. وردبین 🇮🇷 ریزبین

**هووردار** / hûrdar/: ئاوەڵناو. بـێ‌نـرخ؛ کـەم‌بـایی؛ سووک‌وچرووک 🇮🇷 حقیر

**هووردز** / hûrdiz/: ئاوەڵناو. گەنـەدز؛ سـیرمەخۆر؛ دەڵەدز؛ کەفەن‌دز؛ هۆگر و خووگرتـووی دزیـنی شتی بێ‌نرخ 🇮🇷 دلەدُزد

**هووردەم** / hûrdem/: ناو. خولەک؛ دەقیقـە؛ دیقـە؛ پاژێک لە شێست پاژی سەعات 🇮🇷 دقیقه

**هوورش**[١] / hûriş/: ناو. کـار و ڕەوتی بلـند کـردن؛ بەرە ژوور بردن 🇮🇷 برداشت

⊡ **هوورش گرتن**: هەڵگرتن؛ بەرە ژوور بلند کردن 🇮🇷 برداشتن

**هوورش**[٢]: دەنگەناو. خوڕەی ئاو 🇮🇷 صدای جریان آب

**هـوورک** / hûrik/: نـاو. ١. وردەی شـــتێ ٢. جانەوەرێ کە بـە چـاو نابینـدرێ 🇮🇷 ١. خُـردە ٢. جاندار میکروسکپی

**هوورکبین** / hûrikbîn/: ناو. زەڕەبین 🇮🇷 ذرەبین

**هوورکە** / hûrke/: ناو. ١. پیرخەنیلە؛ برووشـی ورد ٢. خاکەی قەند و دار ٣. ورتکە نـان 🇮🇷 ١. بلغـور ریز ٢. خاکە ٣. ریزەنان

**هوورکەنان** / hûrkenan/: نـاو. ورتکەنان؛ وردەنـان؛ ڕێزەنان؛ وردە ــ پردەی نان 🇮🇷 ریزەنان

**هوورک ـ هـوورک** / hûrik hûrik/: ئاوەڵکار. ڕێـز ـ ڕێز؛ ورد ـ ورد ‹کراسێ تـە مـە گروومـە هـوورک ـ هوورک دروومە› 🇮🇷 ریز- ریز

**هوورموور** / hûrmûr/: نـاو. خرەوپرە؛ چەک‌وپـووش 🇮🇷 خرت‌وپرت

**هوورمێش** / hûrmêş/: ناو. ١. مەگەز؛ مەشە؛ مـێش ٢. کۆمەڵی مێشـان؛ مێشـی زۆر 🇮🇷 ١. مگـس ٢. انبوه مگس‌ها

**هوورنڤیس** / hûrn(i)vîs/: ناو. مەرەکەب 🇮🇷 دوات

**هوورنڤیسدان** / hûrn(i)vîsdan/: نـاو. مەرەکەبـدان 🇮🇷 شیشەی دوات

**هوورە** / hûre/: ناو. کای ورد 🇮🇷 کاه ریز

**هوورەشۆپ** / hûreşop/: نـاو. پێشـەنگ؛ ڕەمکـێش؛ سەرگەلە 🇮🇷 پیشاهنگ گله

**هوورەک** / hûrek/: نـاو. پـیتی ورد لـە ئـەلف‌وبێـی لاتیندا 🇮🇷 حروف کوچک در خط لاتین

**هـوورەنێر** / hûrenêr/: ئاوەڵـناو. لێکۆڵــەر؛ تــۆژەر؛ تۆژەرەوە 🇮🇷 پژوهشگر

**هـوور هـوور** / hûr hûr/: ئاوەڵـناو/ ئاوەڵکار. ورد ورد؛ زۆر ورد 🇮🇷 بسیار ریز

**هووری** / hûrî/: ناو. ١. وردی؛ ڕێزی ٢. ورگ؛ گەدە ٣. ☜ حـۆری 🇮🇷 ١. خُـردی ٢. شـکمبە ٣. ☜ حوری

**هـووڕ**[١] / hûř/: نـاو. هـۆڕ؛ جەوالــی زۆر گــەورەی یەکتایی یان دووتایی ‹هووڕ منیش لە بان هەوانەی مەردم! «مەسەل»› 🇮🇷 جوال بزرگ

**هووڕ**[٢]: ئاوەڵناو. وڕ؛ گێژ 🇮🇷 منگ

⊡ **هووڕ بـوون**: تاسان؛ گێژ بوون؛ وڕ بوون 🇮🇷 منگ شدن

**هووڕ**[٣]: پێرۆ. ← **قیژ و هووڕ ـ زرم و هووڕ**

**هوڕووش** / hûřûş/: ناو. گەنمی بە دەستاڕ لێ کراو بۆ ساوەر 🇮🇷 گندم خُرد شده با آسیاب دستی برای حلیم

**هوڕە** / hûře/: ناو. مێشوولەی زۆر ورد 🇮🇷 پشەی خاکی

**هوڕەو**[1] / hûřew/: ناو. کۆمەڵێکی زۆر؛ جەماعەتێ زۆر ‹هووڕەوێ خەڵک هاتن› 🇮🇷 انبوهی از مردم

**هوڕەو**[2]: ئاوەڵناو. زۆر زۆر لە ژمارەدا 🇮🇷 بی‌شُمار

**هوز** / hûz/: ☜ هۆز[1]

**هووژە** / hûje/: ناو. ڕەوتی بە گەل دەرچوونی مێرووله. هەروها: **هووژە کردن** 🇮🇷 فرایند گروهی رفتن مورچگان

**هوسەمل** / hûsemil/: ناو. پیازەخووگانە 🇮🇷 گیاهی است

**هوسی** / hûsî/: ناو. ئەستوندەکی چادر 🇮🇷 ستون چادر

**هوشاندن** / hûşnandin/: چاوگ. دەنگ دەرهاتنی مار کاتی تووڕەیی 🇮🇷 صدای مار هنگام عصبانیت

**هوشک** / hûşik/: ناو. گوڕواسە؛ پشیلەکێوی؛ کتکەکێفیلە 🇮🇷 گُربەی وحشی

**هوشنگ** / hûşing/: ناو. یۆز؛ هاس؛ تاژپلنگ 🇮🇷 یوزپلنگ

**هوشە**[1] / hûşe/: ناو. بافڕۆ؛ دەلەسە؛ فشە؛ درۆی زل. هەروەها: **هووشە کردن** 🇮🇷 چاخان

**هوشە**[2]: دەنگەناو. دەنگی مار 🇮🇷 صدای مار

**هوشەباز** / hûşebaz/: ئاوەڵناو. قەپانچی؛ درۆزنی زل 🇮🇷 چاخان

**هوشی** / hûşî/: ☜ هێشو

**هوفاڵ** / hûfał/: ☜ هوفە ـ٥

**هوفە** / hûfe/: ناو. ١. وفە؛ کوانێکە لە ئاژەڵ دێت ٢. هووشە؛ درۆی زل ٣. کار و کردەوەی گەورە نیشان دانی شتێک ٤. هاشە و هووشە؛ شات و شووت؛ هەرا و هەڕەشەی بن‌شڕ ٥. هووفاڵ؛ لاف و گەزاف؛ کاری خۆهەڵکێشان و پەسنی خۆ دان 🇮🇷 ١. نوعی دُمل دامی ٢. چاخان ٣. اغراق ٤. هارت‌وپورت ٥. لاف

**هوک** / hûk/: ئاوەڵناو. ١. فێرەک؛ متۆ؛ خووگرتوو ٢. گەڕیدە و سەرلێ‌شێواو ٣. وازوازی؛ هەر تاوێ لە سەر بارێ ٤. ئەهوەن؛ لەسەرخۆ ٥. خۆ لە کار بوێر؛ لە بیانوو ٦. دین؛ شێت؛ لێویاگ 🇮🇷 ١. مأنوس ٢. ولگرد و سراسیمه ٣. دمدمی ٤. مُلایم ٥. از زیر کار دررو ۶. دیوانه

**هوکارە** / hûkare/: ئاوەڵناو. خووگرتووی زۆر بە شتێکەوە ‹هووکارە لە سەگ هار بەترە «مەسەل»› 🇮🇷 دارای اعتیاد به چیزی

**هوکدار** / hûkdar/: ☜ هووکڵدار

**هوکل** / hûkił/: ناو. جنۆکە؛ جندۆکە ‹هووکل خۆیان داگە نیشانی!› 🇮🇷 جن

**هوکلدار** / hûkiłdar/: ئاوەڵناو. هووکدار؛ هووکن؛ شێت 🇮🇷 جن‌زده

**هوکن** / hûkin/: ☜ هووکڵدار

**هوکێش** / hûkêş/: ناو. ئەوی لە جەزبەی دەروێشانەدا هوو دەکا ‹یەکێ سۆفییە و یەکێ دەروێشە/ یەکێ نووشتەنووس، یەکێ هووکێشە «قانع»› 🇮🇷 صیحه‌زن

**هول**[1] / hûl/: ناو. هوولە؛ هوویل؛ کاری خۆ هەڵکێشان 🇮🇷 لاف

**هول**[2]: ئاوەڵناو. هوولە؛ هوویل: ١. زۆر زل و قەڵەو (گا) ٢. گوێ سوور (بزن) ٣. بۆری خۆڵەمێشی تاریک ٤. زەردی ئامال خورمایی ٥. واق‌وڕماو؛ سەرلێ‌شێواو 🇮🇷 ١. تنومند و فربه (گاو) ٢. گوش قرمز (بُز) ٣. خاکستری تیره ٤. زرد مایل به خرمایی ٥. سراسیمه؛ هاج و واج

**ـ هول**[3]: پاشەوشە. ـ واش؛ ـ بەش ‹سوورهوول› 🇮🇷 ـ فام

**هوولان** / hûlan/: ☜ هۆلێن

**هوڵانـدن / hûlandin/**: چـاوگ. قریـوە کـردن؛ هـەراوهوریا کـردن ‹جارجاریـک ئـەهووڵێنن/ دوورادوور یـەک ئـەدوێنن «قـانع»› 🇮🇷 هـای‌وهـوی کردن

**هـوڵباف / hûlbaf/**: ناوەڵناو. خۆهەڵـکێش؛ بـە شات‌وشووت 🇮🇷 لافزن

**هوڵولیف / hûlulîf/**: ناو. ئەشکەوت 🇮🇷 غار

**هوڵە[1] / hûle/**: ☜ **هوڵ**

**هوڵە[2]**: دەنگەناو. قووڵە؛ قیڕەی بۆ گورگ ڕەوانـدن 🇮🇷 غریو ترساندن گرگ

**هوڵەهـوڵ / hûlehûl/**: نـاو. هـەرا و هوریـا؛ قووڵـەقووڵ ‹پەروانەیـەک بـە بلبلـی وا وت کـە: بولفزوول!/ سـووتانە ئیشـی ئـەهلی مەحەببـەت، نـە هووڵەهووڵ «مەحوی»› 🇮🇷 داد و بیداد

**هوڵە / hûłe/**: ناو. هولە؛ ملە؛ جۆبڕەک 🇮🇷 آبدُزدک

**هوما / hûma/**: ☜ **هۆما**

▣ **هومای بکۆ**: خوا حەز کا؛ خوا بیکا 🇮🇷 خدا کند؛ انشاء الله

**هومای سینەنێ**: بەشقی خـودا؛ بیکـە لـە ڕاهـی خوادا 🇮🇷 در راه خدا

**هومای کەردکێ**: ۱. سوپاسی خودا ۲. بـەرەکاتی خودا 🇮🇷 ۱. شکر خدا ۲. برکت خدا

**هومای کەنێ**: بەشقی خودا 🇮🇷 به خاطر خدا

**هومای نیکۆ**: خوا نەکا 🇮🇷 خدا نکند

**هومای واژۆ**: بە ئیزنی خوا 🇮🇷 به امید خدا

**هـومارتش / hûmartiş/**: چاوگ. ژمـاردن؛ بـژاردن 🇮🇷 شُمردن

**هومارتۆخ / hûmartox/**: ناو. ژماریـار؛ ژمێریـار 🇮🇷 آمارگر

**هومای / hûmay/**: ☜ **هۆما**

**هـون[1] / hûn/**: ناو. خـوون؛ خـین؛ خـوین؛ خـوێن ‹دیدەم بێ نوورەن جە تـاو ئەسـرین/ هـوون جـێش مەتکیۆ چوون سفتەبرین «بێسارانی»› 🇮🇷 خون

**هون[2]**: ☜ **هەوە[2]**

**هون[3]**: جێناو. ئێوە؛ ئەنگۆ ‹گۆ هوون وەرن بنێرن/ کا ئەم ئیرۆ چ مێرن «جگەرخوێن»› 🇮🇷 شما

**هوناڵو / hûnału/**: ناوەڵناو. خوێناوی؛ خوێناولی؛ تێکەڵ بە خوێن 🇮🇷 خون‌آلود

**هـوناو / hûnaw/**: ناو. خوێنـاو؛ ئـاوی تێکـەڵ بـە خوێن ‹چـەم چەمـەی هوونـاو ئەسـرینش خێـزان/ سـەرنێش قـولاپ، مـوژانش ڕێـزان «سـەیدی»› 🇮🇷 خونابه

**هـونرێژ / hûnřêj/**: ناوەڵـناو. خوێنـرێژ ‹موژانـت هوونـرێژ؛ کوشـندەن قـاتل/ یـەک ـ یـەک چـون خەدەنگ مەدەیشان نە دڵ «سەیدی»› 🇮🇷 خونریز

**هونک / hûnik/**: ☜ **هێنك**

**هونکایی / hûn(i)kayî/**: ☜ **هێنکایی**

**هونگ / hûng/**: ☜ **ئەنگۆ**

**هونـە / hûne/**: ناو. ماڵ؛ خانووی جێگەی ژیان 🇮🇷 خانه

**هونە پا / hûnepa/**: ناو. نۆکەری ناوماڵ 🇮🇷 نوکر

**هونـەدار / hûnedar/**: ناو. کابان؛ کەیوانوو؛ بنەڤان؛ ژنی بناوانی ماڵ 🇮🇷 زن خانه‌دار

**هونـەک / hûnek/**: نـاو. پرچـی وەهـۆنراو 🇮🇷 زُلـف تابیده

**هـون ـ هـون / hûn hûn/**: ناوەڵکار. دۆخـی داڕژانی بێ‌پسانەوە ‹هوون ـ هوون فرمێسکی لە چاو دەباری› 🇮🇷 ریزش بدون انقطاع

**هونی / hûnî/**: ناوەڵناو. خوێنی 🇮🇷 خونی

**هـونیایوە / hûnyaywe/**: چـاوگ. هۆندرانـەوە؛ هۆنیانەوە ‹چوون دانەی تەسـبێح هوونیـاوە دەردم/ هـەی بێـداد! هـەی ڕۆ! هـەی ڕۆی نەبـەردم! «عەبدولوەهاب ئاریانی»› 🇮🇷 به رشته درآمدن

**هووە / hûwe/**: ☜ **هویە**

**هووەرە / hûwere/**: ☜ **هودەرە**

**هوهوکـەرە / hûhûkere/**: نـاو. جـۆرێ کونـد 🇮🇷

نوعی جغد

**هویچ** / hûyç/: ناو. هۆچ؛ هیچ؛ نەتشت 🇮🇷 هیچ

**هویر** / hûyr/: ☜ **هورد**

**هویرک** / hûyrk/: ☜ **هورد**

**هویرک** / hûyrik/: ناو. ۱. گاتوو؛ شاتوو؛ تووەسووره ۲. گوێزنگ؛ چۆک؛ قاپ 🇮🇷 ۱. شاهتوت ۲. قوزک پا

**هویسیر** / hûysîr/: ☜ **هویسیل**

**هویسیل** / hûysîl/: ناو. هویسیر؛ کەندووی لە شووڵ تەنراوی دانەوێڵە 🇮🇷 کندوی ترکه‌ای غلّه

**هویشک** / hûyşk/: ☜ **وشك**[1]

**هویل**[1] / hûyl/: ☜ **هول**[1]

**هویل**[2]: ئاوەڵناو. ۱. ☜ **هول**[2] ۲. حۆل؛ گێژ ۳. والا؛ بەتاڵ؛ خالی 🇮🇷 ۱. ☜ **هول**[2] ۲. گیج ۳. تُهی

**هوین**[1] / hûyn/: ئاوەڵناو. فێر؛ ڕاهاتوو 🇮🇷 آموخته

⊡ **هوین بون** ڕاهاتن؛ فێر بوون 🇮🇷 یادگرفتن

**هوین کرن** ڕاهێنان؛ فێر کردن 🇮🇷 یاد دادن

**هوین**[2]: ☜ **هەوە**[2]

**هوینک** / hûynik/: ☜ **هێنك**

**هوینکایی** / hûyinkayî/: ☜ **هێنکایی**

**هویە** / hûye/: ناو. هوە؛ هویی؛ هووە؛ پاروو؛ سەوڵ؛ بێلی دارین 🇮🇷 پارو

**هوییە** / hûyye/: ناو. نیر؛ داری سەرملی گاجووتان لە کاتی جووت کردندا 🇮🇷 یوغ

**هە**[1] / he/: کار. سێهەم کەسی تاک لە «بوون»: ۱. هەیەتی ‹با بچین بۆ شاهۆ، بەفری هە و ئاوی هە و سێبەری هە› ۲. هەیە؛ هەس 🇮🇷 ۱. دارد ۲. هست

**هە**[2]: ئاوەڵکار. هەر ‹هە بێژە!› 🇮🇷 همواره

**هە**[3]: دەنگ. ۱. وشەی دنە دان ‹هە برام؛ هە کوڕم؛ هە لە منتان کەوێ!› ۲. ئەی؛ هۆ ‹هە یاران!› 🇮🇷 ۱. کلمه‌ی تشجیع ۲. ای؛ حرف ندا

**هەء** / he'/: ☜ **هاء**[1]

**هەئا** / he' 'a/: ☜ **هاء**[1]

**هەب**[1] / heb/: ناو. ۱. دانە؛ دەنک ۲. دەغڵ؛ دانەوێڵە ۳. ☜ **حوب ـ۱** 🇮🇷 ۱. دانه ۲. غله ۳. ☜ **حوب ـ۱**

**هەب**[2]: ئاوەڵکار. تۆزێ؛ کەمووکەیەک 🇮🇷 کمی

**هەباشە** / hebaşe/: ناو. جەڕجەڕ؛ جەنجەر؛ مۆشەن 🇮🇷 خرمنکوب

**هەبان** / heban/: ☜ **هەنبانە**

**هەباندن** / hebandin/: چاوگ. ئەواندن؛ حەباندن؛ حەز لێ‌کردن؛ خۆش ویستن 🇮🇷 دوست داشتن

**هەبانە** / hebane/: ناو. ۱. کووپەڵە و جەڕەی بێ دەسک ۲. ☜ **هەنبانە** 🇮🇷 ۱. خُم و تُنگ بی‌دسته ۲. ☜ **هەنبانە**

**هەباهەب** / hebaheb/: ئاوەڵکار. تاکە ـ تاکە؛ دانە ـ دانە 🇮🇷 یکی ـ یکی

**هەبرمان** / hebirman/: ناو. دانەوێڵە و سەوزی وشکی هەڵگیراو بۆ زستان 🇮🇷 بُنشن و سبزی خشک ذخیره شده

**هەبرەش** / hebreş/: ☜ **ئەبرەش ـ۲**

**هەبرینک** / hebrînk/: ☜ **هەورنگ**

**هەبرینگ** / hebrîng/: ☜ **هەورنگ**

**هەبڕەش** / hebřeş/: ناو. هەبڕەشک؛ سیاوڵە 🇮🇷 سیاه‌دانه

**هەبڕەشک** / hebřeşk/: ☜ **هەبڕەش**

**هەبس** / hebs/: ☜ **هەپس**

**هەبشاندن** / hebşandin/: چاوگ. هەڵپەهەڵپ کردن و فرە خواردن 🇮🇷 لُمباندن

**هەبکی** / hebkî/: ناو. دانوو؛ دانوولە؛ گەنمی لە ئاودا کولاو 🇮🇷 گندم آب‌پز

**هەبل**[1] / hebl/: ناو. هەربل؛ نەخۆشی گرفت 🇮🇷 بیماری امتلا

**هەبل**[2]: ئاوەڵناو. هەربل؛ پڕ؛ تژە 🇮🇷 پُر

**هەبلاوی** / heblawî/: ناو. خەمەرە؛ سابخۆر؛ گرفت؛ نەخۆشی هەرس نەکردنی خۆراک 🇮🇷

بیماری امتلا

**هەبلین**[۱] / heblîn/: چاوگ. هەربلین: ۱. تژی بوون؛ پڕ بوون ۲. تووشی نەخۆشی گرفت بوون ۳. ئالۆز بوون؛ سەرلێ شێوان ☰ ۱. پُر شدن ۲. دچار امتلا شدن ۳. سردرگُم شدن

**هەبلین**[۲]: ناو. هەربلین؛ نەخۆشی گرفت ☰ امتلا

**هەبلە** / hebłe/: ئاوەلناو. گەوج؛ بلح؛ نەزان ☰ ابله

**هەبلەق** / hebłeq/: ☜ نەبلەق ـ۱

**هەبن** / hebin/: ناو. بەندی سنگی ڕەشماڵ ☰ بند دیرک سیاەچادُر

**هەبۆسان** / hebosan/: ناو. ڕازیانە؛ گیایەکی بۆنخۆشە ☰ رازیانه

**هەبو** / hebû/: ئاوەلناو. ۱. دارا؛ بوودە؛ دەولەمەن ‹پیاوێ هەبووە، فەقیر نییە› ۲. خاوەنی بوون ‹دۆخی هەبوو فەرقی لەگەڵ پار زۆرە› ☰ ۱. دارا ۲. موجود

**هەبوون**[۱] / hebûn/: چاوگ. تینەپەڕ. تێپەڕ. //هەبووی؛ دەبی؛ ببە// هەبین: □ تینەپەڕ. ۱. دژی نەبوون ‹بێخود بە کردەوە و قسە، خاکم بە سەر، وەهام/ هەر وەک دەم و جنێوی بتان نیشم و هەشم «بێخود»› □ تێپەڕ. ۲. خاوەنی شتێ بوون ‹با هەزار زێ و گادەر و لاوێنی ڕوونیشمان هەبێ/ تاکوو ژن ئازاد نەبێ سەرچاوەکەی ژین لیخنە «هێمن»› ☰ ۱. بودن ۲. داشتن

■ ئاوەلناوی بەرکاری: هەبوو/ چاوگی نەرێنی: نەهەبوون

**هەبوون**[۲]: ناو. هەبین؛ دارایی ☰ دارایی

**هەبو . نەبو** / hebû nebû/: سارستە. زاراوەی سەرەتای چیرۆکان ☰ یکی بود، یکی نبود

**هەبوونی** / hebûnî/: ناو. ۱. دژی نەبوونی؛ دەولەمەندی ۲. سەلامەت؛ ساغی ☰ ۱. ثروتمندی ۲. سلامت

**هەبەت** / hebet/: ☜ هەڵبەت ـ۱

**هەبەسنای** / hebesnay/: چاوگ. حەپەساندن ☰ هول کردن

**هەبەسیای** / hebesyay/: چاوگ. حەپەسان ☰ هول شدن

**هەبەش** / hebeş/: ئاوەلناو. هەراش؛ بەکەیف ‹کارگ هەبەشە› ☰ بالیده

**هەبەشیک** / hebeşîk/: ناو. مەنقەلی گلینە؛ جۆرێ مقەلی لە قوڕ ☰ نوعی منقل گلین

**هەبەک**[۱] / hebek/: ناو. لەپی دەست؛ بەری دەست ☰ کف دست

**هەبەک**[۲]: ئاوەلکار. پیچەک؛ کەموسکەیێ ☰ اندکی

**هەبەکۆ** / hebeko/: ئاوەلکار. وێدەچێ؛ وا دیارە ☰ مثل اینکه

**هەبی** / hebî/: ناو. ۱. جۆرێ کەندر ۲. لۆکە؛ پەموو؛ پەمۆ ☰ ۱. نوعی کنف ۲. پنبه

**هەبیس** / hebîs/: ناو. تەرکەدنیا؛ مرۆی خۆپاریز و پارسا ☰ زاهد

**هەبین** / hebîn/: ☜ هەبوون

**هەبینا** / hebîna/: ئاوەلکار. تۆزێکی تر؛ کەمێکی دیکە ☰ اندکی دیگر

**هەپ**[۱] / hep/: ناو. ۱. بۆخی زەمینی تەڕ لە بەر گەرمای ڕۆژ ۲. *(منداڵانە)* خۆراکی؛ خواردەمەنی ☰ ۱. بُخار زمین ۲. خوراکی

**هەپ**[۲]: دەنگەناو. حەپ؛ عەف؛ حەپەی سەگ ☰ عو؛ صدای سگ

**هەپرون** / heprûn/: ☜ هەپرون‌بەهەپرون

**هەپرون‌بەهەپرون** / heprûn be heprûn/: ئاوەلناو. ۱. وردوخاش؛ لەتوکوت ‹بە خشکە چوومە سەر لێواری بەرد و خۆم هەلداشت لام وابوو هەپروون‌بەهەپروون دەبم «هەژار، چێشتی مجێور»› ۲. هەزاروهەزار؛ زۆر بەرز و دژوار ‹چیایەکی هەپروون‌بەهەپروونە› ☰ ۱. خُرد و خاش ۲. بسیار بُلند و دشوارگُذر

**هەپس / heps/**: ناو. هولـفدوو؛ هـەبس؛ هـەفس؛ هەفسخانە؛ حەفس؛ زیندان؛ گرتووخانە 🇮🇷 زندان

**هەپش / heps/**: ناو. ١. ☜ **هەسپێ** ٢. پژمـە ٣. کاری پەستاوتن 🇮🇷 ١. ☜ **هەسپێ** ٢. عطسـە ٣. عمل آکندن

⊡ **هەپش کرن**: پـژمین؛ پشـمین؛ پـەنژین 🇮🇷 عطسه کردن

**هەپشاندن / hepşandin/**: چـاوگ. پەسـتاوتن؛ ئاخنین؛ تەپانـدن؛ داگـرتنی دەفـر پڕاوپـڕ و بـە پالەپەستۆ ‹جەواڵ هەپشاندن› 🇮🇷 چپاندن

**هەپشەکوشێ / hepşekuşê/**: ☜ **ئەسپێ‌کوژە**

**هەپشێ / hepşê/**: ناو. ئەسپێ؛ سپێ 🇮🇷 شپش

**هەپک / hep(i)k/**: ناو. ١. کـەرکیت؛ کەلـکیت ٢. تـێلا؛ پـەیاغ؛ داردەسـتی ئەسـتوور ٣. بـەڕەی ئەستوور ٤. *[منداڵانە]* هـەپی؛ خـواردنی منـاڵ بـە زمانی منداڵان ‹هەپکێ بدە بەبکێ!› 🇮🇷 ١. شانەی پودکوبی ٢. چُماق ٣. گلیم کلفت ۴. خوردنی

**هەپلوت / heplût/**: ناو. پەپوولە 🇮🇷 پروانه

**هەپلە[1] / heple/**: ناو. وڕاوە؛ وڕینە 🇮🇷 هذیان

**هەپلە[2]**: ناوەلـناو. خەپلـە؛ کورتـەباڵای قەڵـەو 🇮🇷 کوتاه‌قد چاق

**هەپلەگون / heplegun/**: ناوەلـناو. دەبـەنگ؛ گێـل؛ فەحە 🇮🇷 ابله

**هەپلیهـەپۆ / heplîhepo/**: ناوەلـناو. *[کینایـە]* حەپلی‌حەپاو؛ گێل‌گەوج؛ هیچ لێ نەگەیشـتوو 🇮🇷 نفهم

**هەپلۆک / hepłok/**: نـاو. ئاڵـەکۆک 🇮🇷 گیـاهی از تیرەی شنگ

**هەپۆ / hepo/**: نـاو. ١. جـۆرێ پێشـکەی ورد ٢. هەپە؛ کەرکیت 🇮🇷 ١. نوعی پشەی ریـز ٢. شـانەی پودکوبی

**هەپۆسان / heposan/**: ناو. ڕازیانە؛ ڕاژانە 🇮🇷 رازیانه

**هەپۆلە / hepole/**: ناوەلناو. حـەپۆل؛ زڕتـەزەلامی نەفام 🇮🇷 یاردانقلی

**هەپو[1] / hepû/**: ☜ **پەپوسلێمانە**

**هەپو[2]**: دەنگ. *[منداڵانە]* تەواو 🇮🇷 تمام

**هەپوک / hepûk/**: نـاو. هـەپوو؛ پەپووسلـێمانە 🇮🇷 هُدهُد

**هەپولک / hepûlik/**: ناو. ئاڵەکۆک 🇮🇷 گیاهی است

**هەپە[1] / hepe/**: نـاو. ١. کـەرکیت؛ هـەپک ٢. سـەرمژانە ٣. فریـو؛ گـزی؛ فـێڵ ٤. مهـین؛ چێولیباسی؛ ئەو شوێنە جلکی پێدا دەکەن 🇮🇷 ١. شانەی پودکـوبی ٢. ابـزاری در خـیش ٣. فریـب ۴. رخت‌آویز

⊡ **هەپە نان**: خاپاندن؛ فریودان 🇮🇷 فریب دادن

**هەپە[2]**: دەنگەناو. حەپە؛ عەف؛ حەپ 🇮🇷 واق سگ

**هەپەسان / hepesan/**: ☜ **حەپەسان**

**هەپی / hepî/**: نـاو. *[منداڵانـە]* هـەپک؛ خـواردنی مناڵ بە زمانی منداڵان 🇮🇷 خوردنی

**هەپیلۆک / hepîlok/**: ناوەلناو. بێ‌فـەڕ؛ خوێـڕی 🇮🇷 بی‌غُرضه

**هەت[1] / het/**: ↓

⊡ **هەت دان**: بەرەلا کـردنی بێچـووی ئـاژەڵ بـۆ مژینی دایک ‹بێچووەکان هـەت دە بـا بمـژن!› 🇮🇷 آزاد کردن بچەی دام برای شیر خوردن

**هەت[2]**: ئامراز. نک؛ جەم؛ کن 🇮🇷 نزد؛ پیش

**هەت[3]**: دەنگ. کس؛ وتەی دنەدانی سەگ و ... 🇮🇷 کلمەی برانگیختن سگ و ...

⊡ **هەت دان**: کس‌کس کردن؛ دنەدانی سـەگ 🇮🇷 برانگیختن سگ

**هەتا / heta/**: ئامراز. حەتا؛ تا: ١. ئەو سەری مـاوە و نێوان ‹لێرە هەتا ئەوێ دە میترە› ٢. ئەوەنـدەی؛ ئەونە ‹حەبێک تازە پەیدا بووە ... بۆ تەبەقـەی سـێ هەتا بڵێی زۆرە. من لـەوان دەگێڕمـەوە و دەتـدەمێ «هەژار، چێشتی مجێور»› ٣. وتـەی مـەرج دانـان ‹حیشمەتی خوسرەوی مەحالە هەتا/ جـانی شـیرین

نەکـەن فیـدایی وەتـەن «بێخـود»› ٤. بـۆ ئـەوەی ‹هەمووم داگرت هەتا نەیژی کار ناکا› ٥. تا وەختێ ‹هـەتا تـۆم ئاشـنا بـووی ئاشـنام بـوون/ ئەمێسـتا مووبەمووم ئەغیارە بێ تۆ «نالی»› ◙ ١تا٥. تا

▣ **هەتا سەر:** هەمیشـە ‹دنیـا هـەتا سـەر هـەر وا نابێ› ◙ برای همیشه

**هەتاب / hetab/:** ☜ **هەتاو-١**

**هەتار / hetar/:** ناو. ١. پیـک؛ کـوتکی گـەورە ٢. تاوێر؛ بەردی زلی گلارەوەبوو لە کێـو ◙ ١. پُتـک ٢. صخرەی غلتان از کوه

**هەتارەک / hetarek/:** ناو. زاراوەیـێ منداڵانـە کـە نەورۆز بە ئـاگر دەڵـێن ◙ اصـطلاحی نـوروزی در ادبیات کودکان

**هەتاڤ / hetav/:** ☜ **هەتاو -١**

**هەتاکوانێ / hetak(i)wanê/:** ☜ **هەتاوەکو**

**هەتاکو / hetakû/:** ☜ **هەتاوەکو**

**هەتاکونێ / hetakûnê/:** ☜ **هەتاوەکو**

**هەتاکەتانێ / hetaketanê/:** ☜ **هەتاوەکو**

**هەتاکەتێ / hetaketê/:** ☜ **هەتاوەکو**

**هەتاکینێ / hetakînê/:** ☜ **هەتاوەکو**

**هەتان[١] / hetan/:** ناو. تامان؛ چەپەر؛ تەیمان ◙ در یا دیوار ترکەای

**هەتان[٢]:** ئامراز. ١. تـاوەکوو؛ هـەتاکوو ٢. تـا ئـەم ئەندازە ٣. هێشتا زیاتر ◙ ١. تـا اینکـە ٢. تـا ایـن اندازە ٣. باز هم بیشتر

**هەتانا / hetana/:** ئامراز. ١. تـا ئـەم ئەنـدازە ٢. دیسان زۆرتر ٣. تاکوو؛ تاوەکوو ◙ ١. تا این انـدازە ٢. باز هم بیشتر ٣. تا اینکە

**هەتاناک / hetanak/:** ئامراز. ئەم ئەندازە کەمـە ◙ این مقدار کم

**هەتانوها / hetanuha/:** ئاوەڵـکار. هــەتانهۆ؛ تــا ئێستە ◙ تاکنون

**هەتانهۆ / hetan(i)ho/:** ☜ **هەتانوها**

**هەتانێ / hetanê/:** ☜ **هەتاوەکو**

**هەتاو / hetaw/:** ناو. ١. هەتاڤ؛ هەتاب؛ خۆرەتاو؛ تیشکی خۆر ‹تا زوڵمەتی وجوودە تەریکی لە نووری عیشق/ سێبەر نەما، هەتاوە کـە مـەحوی نـەما خـودا «مەحوی»› ٢. پەلە؛ لەز ‹بە هەتاو هات و تێپەڕی› ◙ ١. آفتاب؛ تابش خورشید ٢. شتاب

▣ **هەتاو بردن:** تاوانگـاز بـوون؛ تـاو بـردن ◙ آفتابزدە شدن

**هەتاو کەفتن:** ☜ **هەتاو کەوتن**

**هەتاو کەوتن:** هەتاو کەفتن؛ خۆر هاتن ◙ آفتاب برآمدن

**هەتاو گەرم بوون:** هەتاو بەرز بوونـەوە ‹وا هـەتاو گەرمە ڕووی زەوی داخە/ ڕێگای ئێستامان بنـاری شاخە «گۆران»› ◙ خورشیدن بالا آمدن

**هەتاوبردو / hetawbirdû/:** ☜ **هەتاوگاز**

**هەتاوبردە / hetawbirde/:** ☜ **هەتاوگاز**

**هەتاوپەرس / hetawperis/:** نـاو. گوڵــەبەڕۆژە؛ ڕۆزامپەرێز ◙ آفتابگردان

**هەتاوگاز / hetawgaz/:** ئاوەڵـناو. هــەتاوبردوو؛ هەتاوبردە؛ تاوانگاز ◙ آفتابزدە

**هەتاوگەز / hetawgez/:** ئاوەڵناو. تاوانگاز؛ تاوگـەز ◙ آفتابزدە

**هەتاوەک / hetawek/:** ☜ **هەتاوەکی**

**هەتاوەکو / hetawekû/:** ئــامراز. هـــەتاکوو؛ هەتاکوونێ؛ هـەتاکینێ؛ هـەتانێ؛ هـەتاوەکوونێ؛ هەتاوەکینێ؛ هەتاکەتانێ؛ هەتاکوانێ؛ هەتاکەتێ: ١. تا؛ هەتا ٢. تا؛ تـاکوو؛ تـا ئەمـەی ‹هـەتاوەکوو نەیەی نایەم› ٣. تا ئەو دەمەی ‹هەتاوەکوو پار هەر دەهات› ◙ ١تا٣. تا

**هەتاوەکونێ / hetawekûnê/:** ☜ **هەتاوەکو**

**هەتاوەکی / hetawekî/:** ئامراز. هەتاوەک: ١. تا بە وێنەی ٢. تاوێک؛ کەمێ لـە زەمـان ◙ ١. تـا بـە گونەی ٢. مدت کوتاهی

**هەتاوەکینێ** / hetawekînê/: ☜ **هەتاوەکو**

**هەتا . هەتا** / heta heta/: ☜ **هەتاهەتایە**

**هەتاهەتایە** / heta hetaye/: ئاوەڵکار. هەتاهەتا؛ تاهەتا؛ بێبڕانەوە ‹هەتاهەتایە قسەت دەگەڵ ناکەم› ☒ تاابد

**هەتاهەتایی** / heta hetayî/: ئاوەڵناو. تا سەر؛ بێبڕانەوەی کات ☒ ابدی

**هەتایی** / hetayî/: ئاوەڵناو. هەمیشەیی ☒ ابدی

**هەتتاکە** / hettake/: ئامراز. تەنانەت؛ تەنانە؛ هەتتاکە ☒ حتّی

**هەتتە** / hette/: دەنگ. هەتە؛ وتەی کەر ئاژۆتن ☒ کلمەی راندن الاغ

**هەترە**[1] / hetre/: ناو. ١. ڕەوتی سەروبەر کردنی گوللە و تیر ‹گوللەکە هەترەی کرد، لێی نەدا› ٢. هەترەش؛ نەترە؛ ورە؛ ورار؛ هێزی دەروونی ☒ ١. خطای تیر ٢. زَهره

**هەترە**[2]: ☜ **هەتلە**

**هەترەش** / hetreş/: ☜ **هەترە**[1]**ـ٢**

**هەترەک** / hetrek/: ناو. هەتار؛ پیک؛ کوتکی بەردشکاندن ☒ پُتک

**هەترەگ** / hetreg/: ئاوەڵناو. زورهان؛ لە کارکەوتە لەبەر پیری ☒ لکنته

**هەتک** / hetk/: ناو. ١. حەیا؛ ئابڕوو ‹هەتکی بردم› ٢. ئەتک؛ کارەساتی سووکایەتی بە سەر هێنان ‹هەتکی کردم› ☒ ١. آبرو ٢. هَتک

▣ **هەتک کردن**: ☜ **هەتکاندن**

**هەتکاندن** / hetkandin/: چاوگ. هەتک کردن؛ ئابڕوو بردن ☒ هتک حرمت کردن

**هەتکی** / hetkî/: ئاوەڵناو. هەتک کراو؛ ئابڕووڕژاو ☒ بی‌آبرو

**هەتکیایش** / hetk(i)yayş/: چاوگ. ئابڕوونەمان؛ ئابڕووچوون ☒ هتک حُرمت شدن

**هەتکین** / hetkîn/: چاوگ. هەتک کران؛ ئابڕوو بران ☒ هتک حُرمت شدن

**هەتلە** / hetle/: ئاوەڵناو. هەترە: ١. ڕەویو؛ هەڵوەدا ٢. ڕێ لێ گۆڕاو ‹ڕێ دەزانم، هەتلە نابم› ☒ ١. رمیده ٢. گُمراه

**هەتمچە** / hetimçe/: ☜ **هەتیمچە**[2]

**هەتمچەرەک** / hetimçerek/: ☜ **هەتیمچە**[2]

**هەتمچەرەکی** / hetimçerekî/: ناو. نانەجیبی؛ خوێڕیایەتی؛ پەستی ☒ پستی

**هەتوان** / hetwan/: ناو. ئەتوان؛ مەڵهەم؛ مەرهەم؛ چرک؛ دەرمانی سەر برین ‹بەز و بنێشت هەتوانێکی خۆمالییە› ☒ مرهم

**هەتۆتە** / hetote/: ناو. هەتووتە؛ هەتهەتۆک؛ مێخەکبەند و شتی بۆنخۆش کە بە جلکییەوە دەدروون ☒ مادەی خوشبویی کە بر لباس می‌دوزند

**هەتۆلمەتۆل** / hetol metol/: ☜ **هەتۆڵمەتۆڵ**

**هەتۆڵمەتۆڵ** / hetoł metoł/: ناو. هەتۆڵمەتۆڵ؛ حللوور بللوور؛ هەلوور بلوور؛ هەتووڵمەتووڵ؛ هەکڵ و مەکڵ؛ هەکڵمەکڵ؛ کایەی منالانە، لاق درێژ دەکەن، سەرمەلا بەیتێک دەخوێنێتەوە و لەگەڵ هەر وشەیەکیدا دەست لە سەر لاقێک دەنێ. دوایین وشەی بەیتەکە، دەست لە سەر هەر لاقێک کەوت، دەبێ بکشێتەوە. دوایین لاق کە نەکشاوەتەوە هی کێ بێ، بردوویەتەوە ☒ اَتَل مَتَل

**هەتوتە** / hetûte/: ☜ **هەتۆتە**

**هەتووڵ** / hetûł/: ناو. وتەی سەرەتای کایەی حللور بلوور ☒ اصطلاحی در بازی کودکانەی اتل متل

**هەتووڵ . مەتووڵ** / hetûł metûł/: ☜ **هەتۆڵ ـ مەتۆڵ**

**هەتە**[1] / hete/: ئامراز. نک؛ جەم؛ کن ☒ نزد

**هەتە**[2]: ☜ **هەتتە**

**هەتەر**[1] / heter/: ناو. ئەتەر: ١. مەودای حوکمی

چاو ‹چاوم هەتەری لێ ناکا؛ تا چاو هەتەر دەکا دەشتە› ٢. هەترە؛ ڕەوتی سەروبەر کردنی تیر؛ وەئامانج نەکەوتن ‹تیرم هەتەر ناکا؛ گوللە هەتەری کرد› ٣. مەودای تیر گەیشتنێ ٤. ئاور؛ ئاگر ٥. تاوێر؛ بەردێ لە کێو بەردەبێتەوە ▤ ١. بُرد دید ٢. خطای تیر ٣. تیررس ۴. آتش ۵. سنگ غلتان از کوه

⊡ **هەتەر تل کردنەوە:** تاوێر غلۆر کردنەوە ▤ سنگ غلت دادن از کوه

**هەتەر کردن:** بڕ کردن؛ بە توانست بوون (بۆ چاو) ▤ دید داشتن (چشم)

**هەتەر**[٢]: ئاوەڵناو. سوور لە سەر مەبەست ▤ مُصر

**هەتەق** / heteq/: دەنگ. درۆیە؛ شا درۆ؛ وتەیەکە بۆ گاڵتە بە درۆ کردن ‹هەتەق لەو قسە ڕاستە!› ▤ اصطلاحی برای تمسخُر دروغ

**هەتەک**[١] / hetek/: ناو. ١. ئاتەگ؛ داوێنی کەوا ٢. نیفۆکی دەرپێ ٣. هاواڵ؛ هاوڕێ ▤ ١. دامن قبا ٢. خشتک شلوار ٣. رفیق

**هەتەک**[٢]: ئامراز. هەتە؛ تەک؛ نزیک؛ لا ▤ همراه؛ نزد

**هەتەل** / hetel/: ناو. تەڵە؛ تەپکە؛ داو ▤ تله

**هەتەهەتۆک** / hethetok/: ☜ هەتۆتە

**هەتی** / hetî/: ☜ هەتیو

**هەتیتە** / hetîte/: ناو. پارچە پۆلایەکی کون‌کونە زێڕینگەران تاڵەزێڕی پێ دەگوشن و ڕاستی دەکەنەوە ‹وەک تاڵی زەعیفم لە هەتیتەی غەمی دووریت/ شایستەیە ئێستاکە کە ئالقەی کەمەرت بم «مستەفا بەگی کوردی» ▤ از ابزار زرگری

**هەتیل** / hetîl/: ناو. پەیکەر؛ کۆتەڵ؛ تیمسال ▤ تندیس

**هەتیم** / hetîm/: ☜ هەتیو

**هەتیمبار** / hetîmbar/: ☜ هەتیوبار

**هەتیمچە**[١] / hetîmçe/: ناو. یەتیمچە؛ هەتیمچەرەک؛ چێشتێکە لە باینجانی قاشکراوی ئالقەیی، پیواز، تەماتە، هێندێک گۆشت و تام و خوێ ▤ آش یتیمچه

**هەتیمچە**[٢]: ئاوەڵناو. هەتمچە؛ هەتمچەرەک؛ هەتیوچە؛ یەتیمچە؛ یەتیمچەرک: ١. نانەجیبی خوێڕی و بێ‌ئابروو ٢. ڕژد؛ چرووک ▤ ١. پست؛ ناکس بچە ٢. خسیس

**هەتیمچەرەک** / hetîmçerek/: ☜ هەتیمچە[١]

**هەتیمی** / hetîmî/: ☜ هەتیوی

**هەتیو**[١] / hetîw/: ئاوەڵناو. هەتی؛ هەتیم؛ هێتم؛ ئێتیم؛ هێتیو؛ یەتیم؛ بابمردوو؛ باوکمردوو؛ سێوی؛ ول؛ یەسیر (دایک مردوو)؛ بێ باب و دایک (بەتایبەت بێ‌باوک) ‹قەت بیرم لەوە نەکردبوو کە ڕۆژێک باوکم دەمرێ و بە سەری شلکی هەتیو دەبم «هەژار، چێشتی مجێور»› ▤ یتیم

⊡ **هەتیو بون:** ☜ هەتیو کەوتن

**هەتیو خستن:** ☜ هەتیو کردن

**هەتیو کردن:** هەتیو خستن؛ باوکی کەسێ لە بەین بردن ▤ یتیم کردن

**هەتیو کەوتن:** هەتیو بوون؛ باوک یا داک مردن ‹نامەوێ هەتیو کەوم/ کەلاوە بێ جێی خۆم «گۆران»› ▤ یتیم شدن

**هەتیو**[٢]: سارستە. هەتی؛ هەتیم؛ هەتیوە؛ ئێتیم؛ یەتیم: ١. وتەی گەف یان سووکایەتی پێ کردن ‹ئەی خوایە بە دەست ئەم هەتیوە دەبەنگ و نازیرەکەوە چ بکەم؟ «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. بە گاڵتەوە دواندنی هاواڵ ‹هەتیو مەحتەلمان مەکە، هەستە با بڕۆین!› ▤ ١. کلمەی تهدید یا تحقیر ٢. خطاب دوستانە

**هەتیوبار** / hetîwbar/: ئاوەڵناو. هەتیمبار؛ خاوەن منالی ورد (بەتایبەت بۆ بێوەژنی دەڵێن) ‹ئەگەر دەستی فەقیر و بێدەستێک بگری، هەتیوێک پۆشتە کەیەوە، بێوەژنێکی هەتیوبار یارمەتی بدەی، بەخشینی پیاوانەیە «هەژار، چێشتی مجێور»› ▤

بچەدار

**هەتیوباری** / hetîwbarî/: ناو. ١. حاڵی هەتیوبار ٢. [کینایە] نەداری و فەقیری ژنی بێمێرد ☰ ١. حالت بیوەی مادر یتیمان ٢. بینوایی بیوه

**هەتیوباز** / hetîwbaz/: ناوەڵناو. [شوورەیی] منداڵباز؛ بەچەباز؛ لووسکەباز ☰ بچەباز

**هەتیوبازی** / hetîwbazî/: ناو. [شوورەیی] بەچەبازی؛ منداڵبازی ☰ بچەبازی

**هەتیوچە** / hetîwçe/: ☜ **هەتیمچە**[٢]

**هەتیوخانە** / hetîwxane/: ناو. جێگەی بەخێو کردنی سێویان ☰ پرورشگاه؛ یتیم‌خانه

**هەتیو ـ مەتیو** / hetîw metîw/: ناوەڵناو. رووتە و پووتە؛ رووت و رەجاڵ ‹مام خواکەرەم دنیادیو/ بانگ ئەکا: هەتیو ـ مەتیو! «قانع»› ☰ اوباش

**هەتیوە**[١] / hetîwe/: ناو. ١. کۆڵەکەی باریکی چادر کە بەر دیرەگی دەدەن ٢. تەختەکوێنی کەنارەی رەشماڵ کە شۆڕ دەبێتەوە ٣. نیسکێنەی توندی بێڕۆن ☰ ١. ستونک پشتیبانەی دیرک چادر ٢. قطعەی آویزان از کنار سیاەچادر ٣. آش غلیظ عدس

**هەتیوە**[٢]: ☜ **هەتیو**[٢]

**هەتیوی** / hetîwî/: ناو. هەتیمی؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی بێباب یان دایک بوون ‹دوکتورەکان بە هەتیوی لە کلیسا بەخێو کرابوون، لە فەرانسە پێخوێندرابوون «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ یتیمی

**هەجاس** / hecas/: ناو. ناوجی؛ ناوبژیکەر ☰ میانجی

**هەجاسی** / hecasî/: ناو. ناوجیگەری؛ ناوبژیکەری ☰ میانجیگری

**هەجامات** / hecamat/: ناو. حەجامات؛ دووژ؛ رکەنە ☰ حجامت

**هەجان** / hecan/: ناو. کووپ کە بۆ لەش رەق بوون دەکاری دێنن ☰ بادکش

**هەجانکەر** / hecanker/: ناو. کەسێ کە کووپ لە لەش دەگرێ ☰ بادکش‌گیر

**هەجب** / hecib/: ☜ **هەجو**

**هەجدە** / hecde/: ☜ **هەژدە**

**هەجدەهەم** / hecdehem/: ☜ **هەژدەهەم**

**هەجدەهەمین** / hecdehemîn/: ☜ **هەژدەهەمین**

**هەجناندن** / hecnandin/: چاوگ. ١. هەجنین؛ داهێزان؛ لەش گران بوون ٢. لاواز کردن ☰ ١. احساس سستی کردن ٢. لاغر کردن

**هەجنەبایەم** / hec(i)nebayem/: ناو. رەشەئەرژەن؛ رەشەهەرجنک ☰ سیاەتوسه

**هەجنین** / hecnîn/: ☜ **هەجناندن ـ١**

**هەجو** / hec(i)w/: ناو. هەجب؛ فڕ؛ کار و رەوتی فڕ پێدا دان؛ خراو گوتن ‹تا بە کەی بێدەنگ بم تا کەی بکەم زەبتی زەبان/ حەیفە گەر هەجوت نەکەم قائیم‌مەقامی بازیان! «شێخ رەزا»› ☰ هجو؛ بدگویی

**هەجوین** / hecwîn/: چاوگ. جوین؛ جاوین ☰ جویدن

**هەجووج** / hecûc/: ناو. ئاجووج؛ عاجووج؛ هاجووج؛ هاواڵی باجووج ☰ یأجوج

**هەجووجک** / hecûcik/: ناو. هەجووجەک؛ هەنجووجک؛ تۆوی هەرمێ ☰ انچوچک

**هەجووجەک** / hecûcek/: ☜ **هەجووجك**

**هەجەت** / hecet/: ناو. ١. ☜ **حاجەت** ٢. [مەجاز] ئەندامی زایەندی نێرینە ☰ ١. ☜ **حاجەت** ٢. آلت تناسلی

**هەجەجک** / hececik/: ☜ **هەچهەجك**

**هەجەر** / hecer/: ناو. گۆڕستان ☰ مقبره

**هەجەل** / hecel/: ☜ **نەجەل**

**هەجەمات** / hecemat/: ☜ **حەجامات**

**هەچهەجک** / hechecik/: ناو. هاجڕەشک؛ هاجهاجک؛ هەجەجک؛ هەژهەژیک؛ پەڕەسێلکە؛ پەڕەسێرکە؛ حاجیڕەش؛ حاجیڕەشک؛ حاجیڕەنگ؛ جۆرێ پەڕەسێلکەی گوێسوانان،

ڕەشی باڵدرێژ و قاچ کورتە 🇮🇷 چلچلە؛ پرستو

**هەجی** / hecî/: ☜ **حاجی**[1]

**هەچ** / heç/: ئاوەڵناو. حەر؛ هەر ‹بە هەچ لایەکا بڕوا؛ هەچ کەس بێ› 🇮🇷 هر

**هەچا** / heça/: ئامراز. ١. پێڕا؛ بە هۆی ٢. بە یەکەو؛ پێکەوە 🇮🇷 ١. بە وسیلەی ٢. با هم

**هەچان** / heçan/: ناو. وچان 🇮🇷 استراحت

⊡ **هەچان دان**: هەچان گرتن؛ وچان دان 🇮🇷 استراحت کردن

**هەچان گرتن**: ☜ **هەچان دان**

**هەچک** / heçik/: ناو. هیچک؛ هێچک؛ هەچەڵ؛ ئالقەی سەری گوریسی باربەند 🇮🇷 وهنگ؛ حلقەی سرِ رسن باربند

**هەچکوچی** / heçkuçî/: ناو. مەویژ؛ مێوژ؛ مێویژ 🇮🇷 مویز

**هەچکۆ** / heçko/: ئاوەڵکار. هەر ئێژی؛ وا دیارە؛ وەک ئەوە وایە ‹هەچکۆ ئاگر بەر بوویە لەشێ من وسان دیشە› 🇮🇷 گویی

**هەچە**[1] / heçe/: ناو. *[مەجاز]* کەر؛ وڵاخ ‹مامە گیان سواری هەچەم ناکەی؟› 🇮🇷 اُلاغ

**هەچە**[2]: دەنگ. وتەی ئاژۆتنی کەر 🇮🇷 کلمەی راندن اُلاغ

**هەچەر** / heçer/: ☜ **هاچەر**

**هەچەڵ** / heçeł/: ناو. ١. ☜ **هەچک** ٢. گیروگرفت؛ دژواری؛ ئاستەنگی ٣. گێچەڵ؛ ڕووشە؛ دەردیسەر. هەروەها: **کەوتنە نێو هەچەڵ** 🇮🇷 ١. ☜ **هەچك** ٢. مُشکل ٣. هَچَل

**هەچەهەچ**[1] / heçeheç/: ناو. *[کینایە]* قسەی زۆر و بێتام 🇮🇷 سُخن یاوە

**هەچەهەچ**[2]: دەنگەناو. وتەی لێخوڕینی کەر ‹بە هەچەهەچی کەرێ، چۆن باری/ لادێیی کوردی دەگاتە شاری؟ «هێمن»› 🇮🇷 صدای راندن الاغ

**هەچهەچک** / heçhecik/: ناو. پەڕەسێلکە؛ پەڕەسێلکە 🇮🇷 پرستو

**هەچی**[1] / heçî/: ناو. دەزوو؛ مەکارە 🇮🇷 نخ

**هەچی**[2]: ئاوەڵناو. *[سوورکەڵە]* ١. هەرچی؛ هەچێ؛ هەرچێک ‹سەندت لە دەسم خودا هەچی مولکی منە/ دات بەو تەرەسەی کە وا نە پیاوە و نە ژنە! «بێخود»› ٢. هەرکەس؛ هەرکی ‹هەچی فورقەت نەدی هیجران نەبێ من داغ و کەی لێنە/ ژ بل دەربێ د هیجرانێ فیراقێ ڕووح و جان کێ دا؟ «مەلای جزیری»› 🇮🇷 هرچە

**هەچێ** / heçê/: ☜ **هەچی**[2]-١

**هەچێکی** / heçêkî/: جێناو. *[سوورکەڵە]* هەرچێکی؛ هەرچێک؛ هەرچی؛ ئەوەی ‹هەچێکی بێتە سەر زارم/ ئەمن دەیڵێم و بێباکم «هێمن»› 🇮🇷 هرچە؛ هرآنچە

**هەد** / hed/: ☜ **حەد**

**هەدا**[1] / heda/: ناو. ئۆقرە؛ ئارام 🇮🇷 آرام

⊡ **هەدا دان**: داسەکنین؛ ئارام گرتن ‹من پەروەردەی بن سێبەری ئەشکەوتم/ گەلێک جاران لە چالاوی ڕەش کەوتم/ هاتمە دەرێ، هەدام نەدا، نەسرەوتم! «هێمن»› 🇮🇷 آرام گرفتن

**هەدا**[2]: ئاوەڵکار. هەچا؛ پێکەوە؛ بە یەکەوە 🇮🇷 با هم

**هەدار**[1] / hedar/: ناو. ١. هەدا؛ ئۆقرە ‹خودێ هەدار بدەتە هەمی› ٢. کەسێ بە پارە کۆمەک بە خەڵک دەکا ٣. دارایی؛ سامان ٤. شانس؛ بەخت 🇮🇷 ١. آرامش ٢. نیکوکار ٣. دارایی ۴. بخت

**هەدار**[2]: ئاوەڵناو. وریا؛ وشیار ‹کووچکێ مە زەهف هەدارە› 🇮🇷 هوشیار

**هەدارهەدار** / hedarhedar/: ناو. یارییەکی منداڵانەیە 🇮🇷 از بازی‌های کودکانە

**هەداری** / hedarî/: ناو. ١. دەسگیرۆیی؛ کۆمەگی بە پارە ٢. ئارخەیانی؛ خاترجەمی ٣. دۆخی سەبووری هاتن؛ ئارام بوون 🇮🇷 ١. کمک مالی ٢. آسودگی خاطر ٣. تسکینِ خاطر

**هەدان / hedan/**: ناو. ١. ئۆقرە؛ ئارام ‹سەبر و هەدانێ مـن نـەمان!› ٢. نیشـانەی پرسیار ٣. گومان؛ دوودڵی ☰ ١. آرام و قرار ٢. علامت سوآل ٣. شک

**هەدانەدەر / hedaneder/**: ئاوەڵناو. هێدی‌نەدەر؛ دانەسەکناو ☰ ناآرام

**هەدد / hedd/**: ناو. کێل؛ بەردی قەبر ☰ سنگ قبر

**هەدراندن / hedrandin/**: چاوگ. داسەکناندن؛ هەدا پێ دان ☰ آرام کردن

**هەدراندی / hedrandî/**: ئاوەڵناو. داسەکناو؛ ئۆقرەگرتوو ☰ آرام‌گرفته

**هەدرە / hedre/**: ئاوەڵناو. ١. لە نارەحەتییان مردوو ٢. چاپک؛ چالاک ☰ ١. دق کرده ٢. چابُک

**هەدرین / hedrîn/**: چاوگ. هەدنین؛ دامرکان؛ داسەکنین؛ ئۆقرە گرتن ☰ آرام گرفتن

**هەدناندن / hednandin/**: چاوگ. خاترجەم کردن؛ دڵنیا کردن ☰ اطمینان خاطر بخشیدن

**هەدنین / hednîn/**: ☜ **هەدرین**

**هەدەر / heder/**: ئاوەڵناو. زایە؛ خەسار؛ فیڕۆ ☰ هدر

⊡ **هەدەر دان**: ☜ **هەدەر کردن**

**هەدەر کردن**: هەدەر دان؛ حەزەر کردن؛ دوور گرتن؛ دووری کردن ‹ئەڕۆی ئۆغر! ئەڕۆی ئۆغر! نەزەر ناکەی، ئەڕۆی ئۆغر!/ حەیام! عەقڵم! دڵ و دینم! هەدەر ناکەی، ئەڕۆی ئۆغر! «گۆران»› ☰ حذر کردن

**هەدەف / hedef/**: ناو. ١. گرد؛ تەپۆڵکە ٢. ئامانج؛ ئارمانج ٣. دۆز و مەبەست ☰ ١. تپەی کوچک ٢. هدف ٣. مرام

**هەدیاییش / hedyayîş/**: چاوگ. هەدا دان؛ ئۆقرە گرتن؛ ئارام بوون ☰ آرام گرفتن

**هەدیداندن / hedîdandin/**: چاوگ. هەڕەشە کردن؛ گەف کردن ☰ تهدید کردن

**هەدیە / hedye/**: ناو. دیاری؛ سەوقات ☰ هدیه

**هەر[1] / her/**: ناو. ١. کەر؛ ولاخ؛ گوێرێژ ٢. خاک؛ خۆڵ ☰ ١. خر ٢. خاک

**هەر[2]**: ئاوەڵناو. هەموو؛ گشت؛ گش ‹نیگاری دڵشکاری من لە هەر فەراز و هەر نشێو/ .../ لە ڕایحەی بەهەشت ئەکا، لە نار ئەکا، لە نوور ئەکا «بێخود»› ☰ هر؛ همه

**هەر[3]**: ئاوەڵکار. ١. تەنیا؛ بەتەنیا ‹هەر خۆت وەرە!› ٢. دایم و دەرهەم ‹هەر هات و هەر دێت› ٣. دایم؛ بۆ هەمیشە ‹هەر بژی؛ هەر خۆش بی› ٤. بێ‌گومان ‹بڕیارم داوە، هەر دەڕۆم› ٥. چۆنەکایی بێت ‹هەر بمدەیە جا بزانە چی دەکەم› ٦. ئەگەر ‹هەر بیخۆی دەزانی چییە› ٧. بێ‌درەنگ ‹هەر هات ملی نا لە جوێن دان!› ٨. عەینەن؛ ڕاست وەکوو ‹بروودەتی هەوایی غەم لە سەرزەمین بڕایەوە/ لیوایی شادی و فەرەح بەجارێ هەڵکرایەوە/ موقەددیمەی شکۆفە هەر لە شاهی نەوبەهار ئەکا «بێخود»› ☰ ١. فقط ٢. مُدام ٣. همیشه ٤. حتماً ٥. درهر حال ٦. همین که ٧. فوراً ٨. دقیقاً

**هەر[4]**: پێشگر. هەڵ ـ ‹هەرخستن؛ هەرستاندن› ☰ بالا؛ برـ پیشوندی در مفهوم «رو به بالا»

**هەرئاوا / her'awa/**: ئاوەڵکار. هەروسا ☰ همچنین

**هەرئێستا / her'êsta/**: ئاوەڵکار. ئەمێستا؛ ئەوێستاکە ☰ هم‌اکنون

**هەرا[1] / hera/**: ناو. ١. پشێوی؛ گێرە و کێشە ‹دیتمان کە جیهان وەها شێواوە/ هەر جەنگ و هەرا لە سەر دراوە «هەژار، *مەم و زین*»› ٢. بانگ؛ قاو؛ دەنگی بەقەوەتی مرۆ ٣. زڵە؛ حەشرەلا؛ شلۆقی ‹لە بەر قووڵە و هەرا گوێچکەم لە قورئان خوێندنم نابێ «جەوهەری»› ☰ ١. آشوب و هنگامه ٢. ندا؛ صدای بلند ٣. شلوغی

⊡ **هەرا کردن**: ١. قاو کردن؛ دەنگ بەرز کردنەوە ٢. گێرە و کێشە کردن ☰ ١. بانگ بر آوردن ٢. مُجادله کردن

**هەرا نانەوە:** کێشە ساز کردن؛ ئاژاوە نانەوە 🇮🇷 آشوب به پا کردن

**هەرا**[٢]: ئاوەڵناو. ١. هەراو؛ پان؛ گوشاد ٢. دوور؛ دژی نزیک 🇮🇷 ١. فراخ؛ گشاد ٢. دور

**هەرات** / herat/: ناو. دەرفەت؛ هەل؛ هەڤراز 🇮🇷 فُرصت

**هەرادنای** / heradnay/: چاوگ. تەمامنای؛ تەواو کردن 🇮🇷 تمام کردن

**هەرادیای** / heradyay/: چاوگ. تەمامیای؛ تەواو بوون 🇮🇷 تمام شدن

**هەرازگانی** / herazganî/: ناو. بێشکە؛ لانک؛ لانکە 🇮🇷 گهواره

**هەراژ** / heraj/: ناو. هەراش: ١. ڕەوتی ڕشانەوە؛ وەڕشین؛ هەڵهاوردنەوە ٢. هێق؛ هێڵنج؛ قرپی ڕشانەوە 🇮🇷 ١. قی ٢. تهوع

**هەراس**[١] / heras/: ناو. ١. ئیسراحەت و ئارامی ‹هەراسی پێ هەڵگرتووم!› ٢. هەراسە؛ خۆف؛ ترس ‹ هیچ هەراسی ناوێ!› 🇮🇷 ١. آرامش و قرار ٢. ترس

**هەراس**[٢]: ئاوەڵناو. جاڕز؛ وەڕەز ‹شا پرسی ئەرێ وەزیر چ باسە/ ئەو دوکتورە بۆچی وا هەراسە «حەقیقی»› 🇮🇷 پریشان

**هەراسان** / herasan/: ئاوەڵناو. ١. تۆقیو؛ زۆر ترساو ٢. جاڕز؛ وەڕەز ‹جە گیان سێر وەردە جە تەن هەراسان/ خاڵۆی خەمیای خەم خاڵ خاڵخاسان «مەولەوی»› 🇮🇷 ١. هراسان ٢. پریشان

**هەراسە** / herase/: ناو. ١. ترس؛ خۆف ٢. داوەڵ؛ داهۆڵ ‹مەلێ لە هەراسە بترسێ، لە برسا ئەمرێ! «مەسەل»› 🇮🇷 ١. بیم؛ هراس ٢. مترسک

**هەراش**[١] / heraş/: ناو. ١. ☜ **هەراژ** ٢. ئالاش؛ هەژگ؛ گەلا و چڵووی کە بە سەر دارەڕای دادەن 🇮🇷 ١. ☜ **هەراژ** ٢. انبیره؛ پوشال روی سقف

**هەراش**[٢]: ئاوەڵناو. ١. لە گەشە؛ بە گەشە ‹بەرخەکە هەراشە› ٢. هەراو؛ لێکبڵاو؛ باز ‹دەمی هەراشە› ٣. تایبەتمەندی بەهارێ کە هەواخۆشی نەکەوێتە دواوە و هەر لە سەرەتاوە گژوگیا گەشە بکەن 🇮🇷 ١. بالنده ٢. گُشاد ٣. ویژگی بهاری که تأخیر نداشته باشد

▣ **هەراش بوون:** ١. گەشە کردن ‹شیناوەرد هەراش بووە› ٢. لێک بڵاو بوون؛ دەست لە یەک بەردان 🇮🇷 ١. بالنده شدن ٢. از هم پاشیدن

**هەراشئاوس** / heraş'awis/: ئاوەڵناو. ئاوسی نزیک بە زان 🇮🇷 آبستن نزدیک به زایمان

**هەراشە** / heraşe/: ناو. نەخۆشییەکی دەغڵە کە زوو ڕواوە و بارانی نەبووە 🇮🇷 بیماری غله از بی آبی

**هەراش ـ هەراش** / heraş heraş/: ئاوەڵناو. لە بەر یەک بڵاو بوو؛ دەست لە یەک بەرداو ‹گۆشتەکە ئەوەندە کوڵیوە هەراش ـ هەراش بووە› 🇮🇷 از هم پاشیده

**هەراشی** / heraşî/: ناو. فراژی؛ فەراژوو؛ پێگەیشتوویی 🇮🇷 بالندگی

**هەراڤستش** / heravistiş/: چاوگ. دوور کەوتنەوە 🇮🇷 دور افتادن

**هەراڵە** / herałe/: ☜ **هەلاڵە**

**هەرام** / heram/: ☜ **حەرام**

**هەرامزا** / heramza/: ☜ **حەرامزادە**

**هەرامزادە** / heramzade/: ☜ **حەرامزادە**

**هەرامۆر** / heramwer/: ☜ **حەرامخۆر**

**هەرامە**[١] / herame/: ئاوەڵکار. کام؛ کامە؛ کێهە 🇮🇷 کدام

**هەرامە**[٢]: جێناو. وانێک؛ واک؛ وانەک؛ ئەوتشت؛ هین 🇮🇷 چیز

**هەرانە** / herane/: ئاوەڵناو. کەرانە؛ بەفیز؛ لەخۆبایی 🇮🇷 مغرور

**هەراو** / heraw/: ئاوەڵناو. گوشاد؛ فرەه ‹دەرپێی هەراو› 🇮🇷 گُشاد

**هەراوزەنا** / hera w zena/: ☜ **هەراوهوریا**

**هەراوهوریا** / hera w hurya/: ناو. هەراوزەنا؛ زەنازەنا؛ چەقە و گوڕە ☰ جنجال و هیاهو

**هەراوی** / herawî/: ناو. هەرایەی؛ گوشادی ☰ گُشادی

**هەراهەرا** / herahera/: ناو. قاوەقاو؛ قیڕەقیر ‹هەر زرم و هووڕ و هەراهەرایە/ سەیرێکی خۆشە وەک سینەمایە «پیرەمێرد»› ☰ سروصدا

**هەرایەر** / herayer/: ئاوەڵکار. دوورتر و دوورتر؛ هەر دوورتر ☰ دور و دورتر

**هەرایەی** / herayey/: ☜ **هەراوی**

**هەرایی** / herayî/: ناو. پانایی؛ بەرینایی ☰ پهنا

**هەربزە** / herb(i)ze/: ناو. گندۆرە؛ کاڵەک ☰ خربُزه

**هەربل**[١] / herbil/: ناو. ١. ☜ **هەبل**[١] ٢. ئاڵۆزی و تێکهاڵاوی ☰ ١. ☜ **هەبل**[١] ٢. درهم‌برهمی

**هەربل**[٢]: ☜ **هەبل**[٢]

**هەربلاندن** / herb(i)landin/: چاوگ. ١. ئاڵۆز کردن (ڕێس و ...) ٢. وەرگەڕاندن؛ چەرخاندن ٣. *[کینایە]* ئاڵۆز کردنی کار ٤. خلەتاندن؛ خاپاندن ☰ ١. سردرگُم کردن (رشته) ٢. چرخاندن ٣. به هم ریختن کار ۴. فریب دادن

**هەربلین**[١] / herb(i)lîn/: چاوگ. ١. ☜ **هەبلین**[١] ٢. خلەتان؛ فریو خواردن ☰ ١. ☜ **هەبلین**[١] ٢. فریب خوردن

**هەربلین**[٢]: ☜ **هەبلین**[٢]

**هەربو** / herbû/: ئاوەڵناو. هەربووگ؛ ئەزەلی؛ بێسەرەتا ☰ ازلی

**هەربوگ** / herbûg/: ☜ **هەربو**

**هەربونی** / herbûnî/: ناو. نەمری؛ تاهەتایی؛ چۆنیەتی هەرمان و نەفەوتان ☰ جاودانگی

**هەربەنە** / herbene/: ناو. کەردار؛ چاروێدار؛ خەربەندە ☰ چاروادار

**هەربی** / herbî/: ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. بە ئاشکرا؛ بە ڕاشکاوی؛ بێ پێچوپەنا؛ ڕەپ و ڕاست ☰ بی‌پرده

**هەربینا** / herbîna/: ئاوەڵکار. هەبینا: ١. بەم زووە؛ بەو زوانە ‹ئەنگۆش هەربینا زانیتان کێ ئاشکرا گومڕا بووە «هەژار، *قورئان*»› ٢. لەپڕ؛ ناکاو؛ لە ناکاو ‹هەربینا هات ئەجەل و من مردم/ با لە شیوێ پەڕ و باڵی بردم «سوارە»› ☰ ١. به همین زودی ٢. ناگهان

**هەرپلە** / herp(i)le/: ناو. وڕاوە؛ ڕاوە ☰ هذیان

**هەرپەرچفین** / herperç(i)fîn/: ☜ **هەڵپەنمان ــ١**

**هەرپەندمان** / herpend(i)man/: چاوگ. *[مەجاز]* وەرەز کردن؛ قەڵس و مەڕز کردن ☰ عاصی کردن

**هەرت** / hert/: دەنگ. وشەی گەڕاندنەوەی گاجووت بۆ سەر خەتی جووت ☰ واژەی برگرداندن گاو به شیار شُخم

**هەرتا** / herta/: ☜ **هەرتاوەکو**

**هەرتاک** / hertak/: ئاوەڵکار. هەرکام؛ ئێکیان ☰ هر یک

**هەرتاکو** / hertakû/: ☜ **هەرتاوەکو**

**هەرتاوەکو** / hertawekû/: ئاوەڵکار. هەرتا؛ هەرتاکوو؛ هەرتاوەکوونێ: ١. تەنیا بۆ ئەمەی ٢. هەتاکوو ☰ ١. فقط برای اینکه ٢. تا اینکه

**هەرتاوەکونێ** / hertawekûnê/: ☜ **هەرتاوەکو**

**هەرتشت** / hertişt/: ☜ **هەرشت**

**هەرتشتێ** / hertiştê/: ئاوەڵکار. هەرچێوە؛ هەرچی؛ هەرچێک ☰ هر چیز

**هەرتک** / hertik/: ☜ **هەردو**

**هەرتم** / hertim/: ☜ **هەرکات**

**هەرتە** / herte/: دەنگ. هەس؛ هەرت؛ وتەی گا لە سەر هێڵ گەڕاندنەوە ☰ صوت برگرداندن گاو در شُخم

**هەرتین** / hertîn/: چاوگ. ئاخ هەڵکێشان لە عەزرەتان ☰ آه حسرت کشیدن

**هەرجا** / herca/: ئامراز. لە جێگەی خۆی؛ قەیدی نییە ‹فەرمایشتەکەت بە هەرجا بەلام منیش بۆچوونی خۆم هەیە› 🇮🇷 به جای خود

**هەرجار** / hercar/: ئاوەڵکار. هەرجارەکی؛ گش جارێ 🇮🇷 هر بار

**هەرجارەکی** / hercarekî/: ئاوەڵکار. ١. ☜ هەرجار ٢. هەر تەنیا جارێک 🇮🇷 ١. ☜ هەرجار ٢. فقط یک بار

**هەرجانە** / hercane/: ناو. بادامی کێوی؛ ئارژەنگ؛ ئەرژنگ؛ ئەرجن 🇮🇷 بادام کوهی

**هەرجایی**[1] / hercayî/: ناو. گوڵێکە لە وەنەوشە دەکا 🇮🇷 گلی شبیه بنفشه

**هەرجایی**[2]: ئاوەڵناو. بەرەڵا؛ گەڕاڵ 🇮🇷 ولگرد

**هەرجن** / hercin/: ناو. هارژن؛ بادامەتاڵە 🇮🇷 بادام تلخ کوهی

**هەرجۆر** / hercor/: ئاوەڵکار. هەرجوور؛ هەرچاڤا؛ هەرچۆنێ بێت 🇮🇷 هرطور

**هەرجو** / hercû/: ناو. تکا؛ ئەرجوو؛ خوایشت؛ مەهدەر 🇮🇷 خواهش

**هەرجوور** / hercûr/: ☜ هەرجۆر

**هەرجێ** / hercê/: ئاوەڵکار. هەرکوێ؛ کام شوێن بێت 🇮🇷 هرکجا

**هەرجێیە** / hercêye/: ئاوەڵکار. هەردەر؛ هەر کوێ 🇮🇷 هرکجا

**هەرچاخ** / herçax/: ☜ هەرکات

**هەرچاڤا** / herçava/: ☜ هەرجۆر

**هەرچشت** / herçişt/: ☜ هەرشت

**هەرچقاس** / herç(i)qas/: ئاوەڵکار. هەرچقاش؛ هەرچەند 🇮🇷 هرچند

**هەرچقاش** / herç(i)qaş/: ☜ هەرچقاس

**هەرچڵە** / herç(i)łe/: ناو. چەرخ و داروبارێ کە بەرداشی پێ دەگوێزنەوە 🇮🇷 چرخ و چوب‌های وسیلەی انتقال سنگ آسیا

**هەرچن** / herçin/: ☜ هەرچەند

**هەرچوارلا** / herç(i)warla/: ناو. هاوێر؛ دەورە 🇮🇷 چهارطرف

**هەرچۆن** / herçon/: ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. هەرجۆر؛ هەرچەشن 🇮🇷 هرطور؛ هرگونه

**هەرچۆنێک** / herçonêk/: ئامراز. حەچکۆ؛ هەرجۆر 🇮🇷 هرطور

**هەرچەن** / herçen/: ☜ هەرچەند

**هەرچەند** / herçend/: ئاوەڵکار. هەرچەن؛ هەرچەندە؛ هەرچیکۆ؛ هەرچن: ١. هەرچیک؛ هەرچەنێک ‹لەو ڕۆژەوە ڕۆویشتووە تۆراوە دلی من/ هەرچەند ئەگەڕێم بێ‌سەروشوێن ماوە دلی من «بێخود»› ٢. ☜ هەرچەندە 🇮🇷 ١. هر قدر ٢. ☜ هەرچەندە

**هەرچەندژی** / herçendjî/: ئامراز. ئەگەریش؛ دەگەڵ ئەوەشا 🇮🇷 با آنکه

**هەرچەندە**[1] / herçende/: ئاوەڵکار. هەرچەند؛ هەرچیک؛ هەرچەندێکی ‹هەرچەندە بژی، هەر دەبێ بمری! «مەسەل»› 🇮🇷 هرقدر

**هەرچەندە**[2]: ئامراز. هەرچەند؛ ئەگەرچی ‹هەرچەندە گوناهی دەمەکەت بارە لە سەر لێو/ حەددی چییە نالی کە بلێ ماچە کەفارەت؟! «نالی»› 🇮🇷 اگرچه

**هەرچەی** / herçey/: ئامراز. ئەگەرچی؛ هەر چەندیش ‹هەرچەی زەمین فرەس گوور وە ئەندازە «مەسەل»› 🇮🇷 اگرچه

**هەرچی**[1] / herçî/: ئاوەڵکار. هەرچەند؛ هەرچیک ‹هەرچی بلێم خەجاڵەتم لە شەرمی جەوهەری حەیا/ کەسێ کە دابخا فەلەک لە ڕێ ئەوا سەری حەیا «بێخود»› 🇮🇷 هر اندازه

**هەرچی**[2]: جێناو. هەرچێک؛ هەرچێوە؛ هەر کارێ ‹دوو ساڵ و دە ڕۆژ خۆش و ناخۆش هەرچی بوو، کارم خوێندنەوە و فێر بوون و خەو بوو «هەژار،

چێشتی مجنور»› ≣ هرچه

**هەرچی**[٢]: لێل. ← **هەرچیپەرچی**

**هەرچیپـــەرچی / herçîperçî**/: ناوەڵـــناو. هەرچیوپەرچی؛ خوێڕی و بەرەڵدا ≣ اوباش

**هەرچیچۆنێ / herçîçonê**/: ناوەڵکار. بـە هـەر بارێکدا ‹هەرچیچۆنێ دەتوانی باری بێنی› ≣ به هر صورت

**هەرچیک / herçîk**/: ☜ **هەرچی**[١]

**هەرچیکۆ / herçîko**/: ☜ **هەرچەند**

**هەرچیوپـــەرچی / herçî w perçî**/: ☜ **هەرچیپەرچی**

**هەرچێوە**[١] / herçêwe/: ناوەڵـکار. هەرچەنـد؛ هەرچەندێک ≣ هر اندازه

**هەرچێوە**[٢]: جێناو. هەرچی؛ هەرچێک؛ هەرتشتێ ≣ هر چیز

**هەرحاڵ / herḧał**/: ناوەڵکار. هەرهاڵ؛ بە هەر حاڵ؛ هەر چۆنێ بێت ≣ در هر حال

**هەرخستن / herxistin**/: ☜ **هەڵخستن**

**هەرخۆت / herxot**/: ☜ **ئەرخوت**

**هەرد**[١] / herd/: ناو. ١. عەرد؛ زەمین ‹پێبلێ گیانە لەم ڕێگە و بانە/ لەم چەم و بێشە و هەرد و کێوانە «یونس دلدار»› ٢. شاخی سەخت و پڕبەرد ‹هەڵوەدا، شێواو، سەرگەردان/ ئاوارەی سەر هەرد و بەردان «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ٣. دەشت و بیاوان ‹ڕۆژی ئەووەڵ بوو کە زانیم من ئەبێ دیوانە بم/ عاشقی تۆم، نەوعی مەجنوون، وا بە کێو و هەردەوە «تاهیر بەگ»› ≣ ١. زمین ٢. کوه سنگی و سخت ٣. دشت و بیابان

**هەرد**[٢]: ☜ **هەردوو**

**هەرداندن / herdandin**/: چاوگ. تووڕە کردن؛ سڵ کردن؛ خەیداندن ≣ خشمگین کردن

**هەردک / herdik**/: ☜ **هەردوو**

**هەردن / herdin**/: چاوگ. خواردن ≣ خوردن

**هەردوان / herd(i)wan**/: ☜ **هەردوو**

**هەردوو / herdû**/: جێناو. هەردوان؛ هەردووک؛ هوردەنی؛ هوردی؛ هوردینە؛ هۆردوو؛ هەرتک؛ هەرد؛ هەردک؛ دووەکان ≣ هردو

**هەردووک / herdûk**/: ☜ **هەردوو**

**هەردووکان / herdûkan**/: ☜ **هەردووکیان**

**هەردووکیان / herdûkyan**/: جێناو. هوردەمێنیا؛ هۆردوک؛ هۆردوکیان؛ هەردووکان؛ هەردینان؛ هەرکان؛ هەر دوویان ≣ هر دوی آنها

**هەردە**[١] / herde/: ناو. ١. خوارن؛ خۆراک ٢. سارا؛ چۆڵ؛ بیاوان ٣. زورکان؛ دەشتی بە گردولکە ≣ ١. خوراک ٢. بیابان ٣. تپه‌ماهور

**هەردە**[٢]: ناوەڵناو. تەرە و چۆڵگەرد ‹مەجنوون خۆ وێڵ بێ، بەتەر بی هەردە/ هەر داش بە سەردا، چوون ئازیزمەردە «سەیدی»› ≣ آواره و دربدر

**هەردە-**[٣]: پێشوشە. ١. وەک؛ چوون؛ لە چەشنی ‹هەردەجاران› ٢. دەشت بیاوان ‹هەردەگێل› ≣ ١. چون؛ مانند ٢. بیابان

**هەردەبانان / herdebanan**/: ناو. کۆساران؛ کوێستانان ≣ کوهساران

**هەردەبیر / herdebîr**/: ناوەڵناو. هەردەمی؛ وازوازی؛ هەر تاوێ لە بارێ ≣ دمدمی

**هەردەپان / herdepan**/: ناو. گۆڕەپان؛ مەیدان ≣ میدان

**هەردەجاران / herdecaran**/: ناو. ڕۆژگارانی پێشین ‹جە کتێبخانە چون هەردەجاران/ نە دەورت دلشاد جەم بەستەن یاران «مەستوورە»› ≣ **گذشته‌ها؛** قدیم‌الایام

**هەردەر / herder**/: جێناو. هەر کوێ؛ هەرجێیە ≣ هرکجا

**هەردەگێل / herdegêł**/: ناوەڵناو. بیاوانگەڕ؛ چۆڵگەرد؛ فێرەگەڕان یان کۆچ لە بیاواندا ‹هارەی هەراسان، هەردەی هەردەگێل/ کەم دەور دە نە وێت

چوون دیوانەی وێڵ «سەیدی»» ⚑ بیابانگرد

**هەردەم / herdem/:** ☜ **هەرکات**

**هەردەمی / herdemî/:** ☜ **هەردەبیر**

**هەردەن / herden/:** چاوگ. خواردن؛ خارن ⚑ خوردن

**هەردەنی / herdenî/:** ئاوەڵناو. شیاوی خواردن ⚑ خوردنی

**هەردهەژ / herdhej/:** ناو. بوومەلەرزە؛ زەلزەلە ⚑ زلزله

**هەردی / herdî/:** ئاوەڵناو. کۆساری؛ کێفسانی؛ کوێستانی؛ خەڵکی کێوپارە ⚑ کوهستانی

**هەردیسە / herdîse/:** ناو. ئەڕدێن؛ ڕدێن؛ ڕیش ⚑ ریش

**هەردین / herdîn/:** چاوگ. ١. خەیدین؛ قەڵس بوون؛ سڵ بوون ٢. هەرژین؛ ترازان؛ جوێ بوونەوە ٣. هەرژین؛ هەلا ــ هەلا بوون (وەک: زەوی لە کاتی بەهاردا) ⚑ ١. خشمگین شدن ٢. از جا دررفتن ٣. وارفتن

**هەڕۆ / herřo/:** ☜ **هەڕۆژ**

**هەڕۆژ / herřoj/:** ئاوەڵکار. هەڕۆ؛ هەرۆز؛ هەرۆ؛ گش ڕۆژێ ‹هەڕۆژ ئاژاوەیەک دەنێتەوە› ⚑ هر روز

**هەڕۆژی / herřojî/:** ئاوەڵکار. ڕۆژانە؛ هەموو ڕۆژێک ‹ئەمە کاری هەڕۆژیتە› ⚑ روزانه

**هەرز[1] / herz/:** ناو. ١. فیڕۆ؛ خەسار؛ بە هیچێ چووگ ٢. هەرێز؛ فریزوو؛ فرێز؛ گیای چیمەن کە بژارێکی دژوارە ⚑ ١. هدر ٢. فریس

⊡ **هەرز بون:** بە فیڕۆ چوون؛ زایە بوون ⚑ هدر رفتن

**هەرز[2]:** ئاوەڵناو. ١. بژار؛ بێبەهرە (گیا) ٢. هەرزە؛ گوێنەدەر؛ کەمتەرخەم؛ لاسار لە ئاستی داب و نەریت و بایەخی کۆمەڵگا ‹من شمشاڵێکی سەرەڕۆ و هەرز نەبووم/ تا ڕێگە بەم هەموو لێوێ فووم لێ بکا «شێرکۆ»› ⚑ ١. هرز ٢. سبُکسر

**هەرزالک / herzalik/:** ☜ **هەرزاڵ**

**هەرزاڵ / herzał/:** ناو. هەرزالک؛ هەرزەڵ؛ هەرزیل؛ هەرزێلک: ١. هەرزاڵە؛ پێڕک ٢. کەپری ناو ڕەز و بێستان کە لە سەرییەوە چاویان بە هەموو لایەکییەوە بێ ⚑ ١. سکو مانندی از چوب برای اثاثیەی چادر ٢. آلاچیغ باغ

**هەرزاڵە / herzałe/:** ناو. ١. ☜ **هەرزاڵ ــ١** ٢. ڕێزەڵە؛ هلەرزە؛ تەماتەمرۆژە ⚑ ١. ☜ **هەرزاڵ ــ١** ٢. تاجریزی

**هەرزاڵێ / herzałê/:** ناو. میلۆدییەکی کۆنی ناوچەی سنەیە ⚑ آهنگی کُردی

**هەرزان[1] / herzan/:** ئاوەڵناو. ئەرزان؛ کەمنرخ؛ کەمبایی؛ مەلاخۆر ‹دەتفرۆشن بە قیمەتی هەرزان/ دەتدەنە دەستی ناکەس و هەرزان «هێمن»› ⚑ ارزان

**هەرزان[2]:** ئاوەڵکار. ئەرزان؛ بە نرخی کەم ‹دەخیلە خۆت هەرزان نەفرۆشی!› ⚑ ارزان

**هەرزانبایی / herzanbayî/:** ئاوەڵناو. کەمنرخ؛ بە قیمەتێکی کەم ⚑ ارزان قیمت

**هەرزانجان / herzancan/:** ئاوەڵناو. تایبەتمەندی فرۆشیارێ کە شت بە نرخی کەم دەفرۆشێ. بەرانبەر: **گرانجان** ⚑ ارزان‌فروش

**هەرزانفرۆش / herzanf(i)roş/:** ئاوەڵناو. هەرزانجان؛ تایبەتمەندیی کەسێ کە ئاکار و خدەی بەرەو لای هەرزان فرۆشتن هەبێت. هەروەها: **هەرزانفرۆشی** ⚑ ارزان‌فروش

**هەرزانکڕ / herzankiř/:** ئاوەڵناو. [کنایە] ١. فەقیر و نەدار ٢. ڕژد؛ چکووس ⚑ ١. بینوا ٢. خسیس

**هەرزانی / herzanî/:** ناو. ١. بار و دۆخی زۆر و کەمبایی بوونی شتومەک ٢. سەردەمێ کە ئاتاجی ژیان فراوان و هەرزانە ⚑ ١و٢. ارزانی

**هەرزل / herzil/:** ناو. ئەنگووتکە هەویری پچووک ⚑ چونەی کوچک خمیر

**هەرزڵ** / herził/: ئاوەڵناو. پواوی لە بەر یەک چوو؛ ڕزیوی هیچ بە سەر هیچەوە نەماو 🇮🇷 پوسیده

**هەرزڵ . هەرزڵ** / herził herził/: ئاوەڵناو. تەواو پواو 🇮🇷 کاملاً پوسیده

**هەرزن** / herzin/: ناو. ئەرزن؛ هەرزین؛ باچیک؛ کۆرەک؛ کوریک؛ گەلدوو؛ ڕەمەرانە؛ سۆزک؛ سوورکە؛ گاڵ؛ گیەڵ؛ گەنمە شامیە سوورە؛ زڕاتە کێویلە؛ ڕوەکێک لە بنەماڵەی گەنم کە تۆمەکەی ورد و لووسە و خۆراکی مەلانە 🇮🇷 ارزن

**هەرزنە** / herz(i)ne/: ناو. ١. خونچەی گوڵی ڕەز ٢. گیایەکی بژار لە تووتندا ٣. هەرزنەکی؛ باریکە؛ باڵندەیەکە لە تۆرەمەی بەرگاویلە 🇮🇷 ١. غنچەی شکوفەی تاک ٢. گیاهی هرزه در کشتزار توتون ٣. پیت خاکی

**هەرزنەتاڵە** / herz(i)netałe/: ناو. گاڵ؛ جۆرێ هەرزن کە چێژەی تاڵە 🇮🇷 ارزن تلخ

**هەرزنەکی** / herz(i)nekî/: ☜ هەرزنە ـ٣

**هەرزنەکێویلە** / herz(i)nekêwîle/: ناو. گیایەکی خۆڕسکە بەرێکی وەک هەرزن دەگرێ 🇮🇷 ارزن کوهی

**هەرزنەگەورە** / herz(i)ne gewre/: ناو. گارس؛ زوڕات؛ هەرزنە سپیلکە کە بە هێشوو دەبێ و دەنکی درشتە 🇮🇷 گاورس

**هەرزنەگێلۆش** / herz(i)negêłoş/: ناو. جۆرێ هەرزن کە شکلی لە گەنمەشامی دەکا 🇮🇷 نوعی ارزن با دانەهای مانند بلال

**هەرزە**[1] / herze/: ناو. گیای بژار 🇮🇷 علف هرز

**هەرزە**[2]: ئاوەڵناو. ١. گوێنەدەر؛ لاسار لە ئاستی داب و نەریت و بایەخی کۆمەڵگادا ‹کەسێکی هەرزە بە مەجنوونی وت: خەلیفەکە مرد/ وتی: بە من چی؟ ئەتۆ بمرە! چاوی لەیلا خۆش! «مەحوی»› ٢. سەربزێو؛ سەرسەخت؛ لاسار لە باری سەر نەهاوردنە ڕێوە 🇮🇷 ١. سبُکسر ٢. خیرەسر

**هەرزەبێژ** / herzebêj/: ئاوەڵناو. هەرزەدڕ؛ هەرزەوێژ؛ دەمبەرەلا؛ گەوجانەڕێس ‹ئەمانە بێشعوور و گێژ و وێژن/ موتیعی لۆتی خوێڕی و هەرزەبێژن «حاجی قادر»› 🇮🇷 هرزەگو

**هەرزەپیاو** / herzep(i)yaw/: ئاوەڵناو. جەلۆ؛ سەرسەری؛ ئەڵوات 🇮🇷 لات

**هەرزەچن** / herzeçin/: ناو. بژارکەر 🇮🇷 وجین‌کننده

**هەرزەچەنە** / herzeçene/: ئاوەڵناو. [پلار] هەرزەبێژ 🇮🇷 وراج

**هەرزەدڕ** / herezdiř/: ☜ هەرزەبێژ

**هەرزەکار** / herzekar/: ناو. تازەلاو ‹نەشئەی دەماغتە دڵی ڕێبواران/ جێی ساز و سەودای بۆ هەرزەکاران «پیرەمێرد»› 🇮🇷 نوجوان

**هەرزەکاری** / herzekarî/: ناو. ڕۆژانی لاوی ‹بە هەرزەکاریم کە باوکم ساغ بوو/ هەرزەگەردیمان لە لا یاساغ بوو «پیرەمێرد»› 🇮🇷 دوران نوجوانی

**هەرزەگۆ** / herzego/: ئاوەڵناو. قڕبێژ؛ گەفۆک؛ کۆڵەوێژ ‹تەمای وەیانە ڕاپەڕن، ببزوون/ لێوی دوژمنی هەرزەگۆ بدروون «هێمن»› 🇮🇷 یاوەگو

**هەرزەگۆیی** / herzegoyî/: ناو. کار و ڕەوتی قسەی بێتام گوتن ‹هەرزەگۆییم کرد هەرچیم وت/ وا ئەو چلکەم بە فرمێسک شت «گۆران»› 🇮🇷 ژاژخایی

**هەرزەگەرد** / herzegerd/: ئاوەڵناو. وێڵ؛ بەرەلا ‹لەحزێکی من لە سەومەعەدا دیبوو، ئەمری دا/ ئەو هەرزەگەردە لەم دەرە دەرکەن، نەیێتەوە! «مەحوی»› 🇮🇷 ولگرد

**هەرزەڵ** / herzeł/: ناو. ١. ☜ هەرزاڵ ٢. کەپرەشینەی جوولەکان 🇮🇷 ١. ☜ هەرزاڵ ٢. جشن میوەبندان کلیمیان

**هەرزەمەشق** / herzemeşq/: ناو. ڕاهێنانی خۆشنووسی بەتایبەت بە قەڵەم زەل 🇮🇷 سیاەمشق

**هەرزەنەبژار** / herzeneb(i)jar/: ناو. گارس؛

کارس 🇮🇷 گاورس

**هەرزموێژ / herzewêj/:** ☜ **هەرزەبێژ**

**هەرزەیی / herzeyî/:** ناو. کاری سووک و بێئابڕوویانە 🇮🇷 هرزگی

**هەرزیل / herzîl/:** ☜ **هەرزاڵ**

**هەرزین / herzîn/:** ☜ **هەرزن**

**هەرزێلک / herzêlik/:** ☜ **هەرزاڵ**

**هەرژاندن / herjandin/:** چاوگ. ١. داڕزاندن؛ پلێخاندنەوە ٢. لە ناو بردن؛ نەهێشتن ٣. هەلا بە هەلا کردن (بە زۆر کولاندن) ٤. تەخشان و پەخشان کردن؛ بێجێ خەرج کردن 🇮🇷 ١. لە کردن ٢. از بین بردن ٣. از هم پاشاندن ۴. ریخت‌وپاش کردن

**هەرژین / herjîn/:** چاوگ. هەلا ـ هەلا بوون 🇮🇷 وارفتن

**هەرس / hers/:** ناو. ١. ورچ؛ حەمەش ٢. ☜ **هەرسی** ٣. عەزرەت؛ تاسە ٤. ئیسکە؛ نسکە؛ نزگەرە ٥. کاری هەڵکێشانی ئاخ 🇮🇷 ١. خرس ٢. اشک ٣. اشتیاق ۴. سکسکه ۵. عمل آه کشیدن

**هەرسات / hersat/:** ناوەلکار. هەردەم؛ هەموو کاتێ ‹چوون کوورەی ئاهێر دووی هەناسەمەن/ هەرسات نە دڵدار سەد وەسواسەمەن «سەیدی»› 🇮🇷 هرلحظه

**هەرساندن / hersandin/:** چاوگ. ڕاهێنان؛ فێر کردن 🇮🇷 آموختن

**هەرستاندن / heristandin/:** چاوگ. ١. تێک شکاندن ٢. وردوخاش کردن ٣. پێ ڕێخستن؛ لە ژێر پێیان پانەوە کردن ٤. لە خەو هەڵساندن ٥. بلند کردن و ڕاوەستاندن 🇮🇷 ١. درهم شکستن ٢. خُردوخمیر کردن ٣. زیر پا له کردن ۴. از خواب بیدار کردن ۵. بلند کردن و سرپا نگهداشتن

**هەرستن / heristin/:** ☜ **هەرستین**

**هەرستین / heristîn/:** چاوگ. هەرستن: ١. شکاندن ٢. وردوخاش کردن ٣. پێ ڕێخستن؛ لە ژێر پێیان پانەوە کردن 🇮🇷 ١. شکستن ٢. خُردوخمیر کردن ٣. زیر پا له کردن

**هەرسک / hersik/:** ☜ **هەرسەك**

**هەرسە / herse/:** ناو. مەیان؛ مەیدان ‹لە هەرسەی شاترنجی ئیعتقادا/ لە سەر ئەسپی سەداقەت شایە خادم «بێخود»› 🇮🇷 عرصه

**هەرسەک / hersek/:** ناو. هەرسک؛ کار و ڕەوتی هەڵتاوین؛ تاواننەوەی خۆراک لە ورگدا 🇮🇷 هضم؛ گوارش

**هەرسی / hersî/:** ناو. هەرس؛ هەرش؛ هەرەس؛ هەسر؛ ئەرس؛ هەستار؛ هێسیر؛ هێستر؛ ئەسرین؛ فرمێسک 🇮🇷 اشک

⊡ **هەرسی ڕشناییش:** فرمێسک ڕژاندن 🇮🇷 اشک ریختن

**هەرسیک / hersîk/:** ناو. هەرمووسک؛ هەرمووشک؛ جرجە مشک 🇮🇷 موش کور

**هەرسیل / hersîl/:** ناو. بەردی گۆشەی بناغەی دیوار 🇮🇷 سنگ شالودەی نبش دیوار

**هەرسین / hersîn/:** ناوەلناو. فرمێسکاوی؛ ئەسریناوی ‹موسوڵمۆنا ئەز عاشقنۆ، تەن و جەستەم پەشێوحاڵۆ/ تلێم خەستە، دڵم خەمگین، چەمم هەرسین، زوان لاڵۆ «سەیدی»› 🇮🇷 اشک‌آلود

**هەرش / herş/:** ☜ **هەرسی**

**هەرشت / herşit/:** جێناو. هەرتشت؛ هەرچشت؛ هەرشتە؛ هەرشتێ؛ ئەوی شتە بە گشتی 🇮🇷 هرچیز

**هەرشتە / herş(i)te/:** ☜ **هەرشت**

**هەرشتە / herişte/:** ناو. ئاردە بەهارووی بە ئاو شێلدراوی داو- داوکراوی وشکەوەکراو 🇮🇷 رشتەی آشی

**هەرشتێ / herş(i)tê/:** ☜ **هەرشت**

**هەرشتێک / herşitêk/:** جێناو. هەرشتێ؛ هەرگووچی 🇮🇷 هرچه

**هەرفتین / heriftîn/:** ☜ **هەرفتن**

**هەرفین / herftîn/:** ☜ **هەرفین**

**هەرڤ / herv/:** ناو. جەنگ؛ شەڕ ☰ جنگ

**هەرڤاندن / hervandin/:** ☜ **هەرفاندن**

**هەرڤە / herve/:** ئاوەڵناو. چالاک؛ چابک ☰ چابک

**هەرق / herq/:** ناو. خەندەک؛ کەندەک؛ ڕەهەند ☰ خندق

**هەرک / herk/:** ناو. ١. تۆمی دانەوێڵە ٢. درە؛ ئەو دەغڵەی کە بۆ تۆوی جیا دەکەنەوە ☰ ١. تُخم غلات ٢. غلەی ویژەی بذر

**هەرکات / herkat/:** ئاوەڵکار. هەرتم؛ هەرچاخ؛ هەردەم؛ هەرگا؛ هەرگاڤ؛ هەرگاو؛ گش وەخت ‹هەرکات برۆی، منیش دێم› ☰ هرگاه

**هەرکاتێ / herkatê/:** ئاوەڵکار. هەر دەمێ ‹لاوەکان هەرکاتێ جێژنی ڕۆژی ئازادی دەکەن/ بێننەوە بیرتان هەژارێک، شاعیرێکی زاری کورد «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ☰ هرگاه

**هەرکام / herkam/:** جێناو. هەریەک ☰ هر کُدام

**هەرکان[1] / herkan/:** ئاوەڵناو. نەزۆک؛ نەزا؛ ئەستێور؛ قسر ☰ نازا؛ عقیم

**هەرکان[2]:** ☜ **هەردووکیان**

**هەرکاندن / herkandin/:** چاوگ. نەزۆک کردن ☰ عقیم کردن

**هەرکولۆج / herkuloc/:** ئاوەڵکار. هەرچۆن؛ بە هەر ئاوایەک ☰ هرطور

**هەرکوێ[1] / herk(i)wê/:** ئاوەڵکار. هەرکۆ؛ هەرکوورە؛ هەرجێ؛ هەردەر ‹هەرکوێ دانیشی گوێت هەڵدەکێشن› ☰ هرکجا

**هەرکوێ[2]:** جێناو. هەرکۆ؛ هەرکوورە؛ هەرجێ؛ هەردەر ‹بڕۆین بۆ هەرکوێ، هەر ئەو خەرمان و هەر ئەو گێرەیە «مەسەل»› ☰ هرکجا

**هەرکۆ / herko/:** ☜ **هەرکوێ**

**هەرکۆڕ / herkor/:** ئاوەڵناو. هەڵکۆڵ؛ زەوی کۆڵ ☰ زمین کَن

**هەرکوو / herkû/:** ئاوەڵکار. ١. هەرچۆن؛ هەرچۆنێ ٢. هەر؛ هەرکە؛ دەمودەست ‹هەرکوو بینیم، پێ ئێژم› ☰ ١. هرطور ٢. به محض

**هەرکوودە / herkûde/:** ئاوەڵکار. ١. بۆ هەر کوێ ٢. لە هەر کوێ ☰ ١. به هر کجا ٢. در هر کجا

**هەرکوورە / herkûre/:** ☜ **هەرکوێ**

**هەرکە[1] / herke/:** ئاوەڵکار. بێدرەنگ ☰ همین‌که

**هەرکە[2]:** ☜ **هەرکەس**

**هەرکەبۆخۆی / herke bo xoy/:** ئاوەڵناو. ١. کەس‌لەکەس؛ هەرکەس ـ هەرکەس؛ هەرکە ـ هەرکە؛ شپرز و شێواو ٢. بێ قانوونی ؛ زۆردار و بێ‌زۆر ☰ ١. هرکی ـ هرکی ٢. بی‌قانونی

**هەرکەس / herkes/:** جێناو. هەرکە؛ هەرکی؛ هەرکێ؛ هەر بنیادەمێ ‹هەرکەس لە شار خوەیا پاشاس «مەسەل»› ☰ هرکس

**هەرکەس ـ هەرکەس / herkes herkes/:** ☜ **هەرکەبۆخۆی ـ١**

**هەرکەسێ / herkesê/:** جێناو. ئەوی؛ هەرکەس ☰ هرکه

**هەرکە ـ هەرکە / herke herke/:** ☜ **هەرکەبۆخۆی ـ١**

**هەرکی / herkî/:** ☜ **هەرکەس**

**هەرکین / herkîn/:** چاوگ. ١. نەزۆک بوون؛ لە زگ‌وزا کەوتن ٢. بزووتن؛ جوولان ☰ ١. نازا شدن ٢. جُنبیدن

**هەرکێ / herkê/:** ☜ **هەرکەس**

**هەرگ / herg/:** جێناو. هەریەک؛ هەرکام ☰ هرکُدام

**هەرگا / herga/:** ☜ **هەرکات**

**هەرگاڤ / hergav/:** ☜ **هەرکات**

**هەرگاو / hergaw/:** ☜ **هەرکات**

**هەرگل / hergil/:** ئاوەڵکار. هەرجار ☰ هر دفعه

**هەرگو / hergû/:** جێناو. هەرگ؛ هەریەک ☰

هریک
⊡ **هەرگو جای ڕۆشیاییش:** هەرکەس بە لایەکدا بلاوە کردن ⌶ هرکسی بە سویی متفرق شدن
**هەرگووچی / hergûçî/:** جێناو. هەرشتێک ⌶ هرچیزی
**هەرگوویەو / hergûyew/:** جێناو. هەریەکی ⌶ هریکی
**هەرگیز / hergîz/:** ئاوەڵکار. هەرگیس؛ هێرگیز؛ قەت؛ بە هیچ کلۆجێ ‹لەو یۆسفە پرسیومە لە بێگانە و لە یاران/ هەرگیز نییە سۆراخی لە هیچ لاوە دڵی من «بێخود»› ⌶ هرگز
**هەرگیزایهەرگیز / hergîzayhergîz/:** ئاوەڵکار. بە هیچ شێوەیەک؛ تا ماوە مابێ ‹بەڵام تەبیعت هەرگیزایهەرگیز/ بێڕووناکییە بێ بزەی ئازیز «گۆران»› ⌶ اصلاً؛ هرگز
**هەرگیس / hergîs/:** ☜ هەرگیز
**هەرلا[1] / herla/:** ئاوەڵناو. هەمیشە لاسار ⌶ همواره لجباز
**هەرلا[2]:** جێناو. گش ئالییەک؛ هەموو لایەک ‹بۆ هەرلا دەست بکێشی وەک سەگی هار دێ بە گژتا «شێرکۆ»› ⌶ هر طرف
**هەرلە / herle/:** ناو. داپیرۆشک؛ پیرێژنۆکە؛ پیرایشۆکە ⌶ خرخاکی
**هەرلەجێ / herlecê/:** ئاوەڵکار. جێبەجێ؛ دەسبەجێ ⌶ درجا؛ فوراً
**هەرمان / herman/:** ناو. هەرگیز نەفەوتان ‹ڕێیەکم پێ بڵێ بۆ هەرمانم/ تۆی لە لات دەس دەکەوێ دەرمانم «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ⌶ جاودانگی
**هەرماندن / hermandin/:** چاوگ. پەشێلاندن؛ ڕووخاندن؛ ڕماندن ⌶ ویران کردن
**هەرمانە / hermane/:** ناو. کار؛ شووڵ؛ خەبات؛ فرمان
**هەرماو / hermaw/:** ئاوەڵناو. باقی؛ نەمر. هەروەها: **هەرماوی** ⌶ مانا؛ جاوید
**هەرمک / hermik/:** ئاوەڵناو. نێرەمووک؛ نە نێر نە مێ ⌶ خُنثا؛ نه نر و نه ماده
**هەرملیسین / herm(i)lîsîn/:** ☜ هەڵملیسین
**هەرملی / hermiłî/:** ☜ هێرۆ
**هەرمۆ / hermo/:** ☜ هەرمێ
**هەرمووسک / hermûsik/:** ☜ هەرسیك
**هەرمووش / hermûş/:** ناو. هێشوە ترێی بەدارەوە وشکەوە بوو ⌶ خوشەانگور خشک شده بر درخت
**هەرمووشک / hermûşik/:** ☜ هەرسیك
**هەرمە / herme/:** ناو. شان؛ پیل؛ مل ⌶ کتف
**هەرمەت / hermet/:** ☜ هەرمەند
**هەرمەل / hermel/:** ناو. ئەسپەندەر ⌶ اسپند
**هەرمەلە / hermele/:** ناو. هەرا و چەقەچەق؛ گێرە و نێرە ⌶ سروصدای جنجال
**هەرمەڵە / hermełe/:** ☜ هێرۆ
**هەرمەڵی / hermełî/:** ☜ هێرۆ
**هەرمەڵێ / hermełê/:** ☜ هێرۆ
**هەرمەند / hermend/:** نزا. هەرمەت؛ تووکێکە واتا: بتۆپی، کوێر بی ⌶ نوعی نفرین
**هەرمەنی / hermenî/:** ناو. ئەرمەنی؛ ئارانی: ١. هۆزێک لە ڕەگەزی ئاریایی، دانیشتووی هەرمەنستان ٢. هەرکام لە کەسانی ئەو هۆزە ٣. یەکێ لە زمانگەلی هیندو- ئورووپایی کە ئەرمەنی قسەی پێ دەکەن ⌶ ١تا٣. ارمنی
**هەرمی / hermî/:** ☜ هەرمێ
**هەرمێ / hermê/:** ناو. هارمێ؛ هرمی؛ هرمێ؛ هورمی؛ هولوو؛ هەمرۆ؛ هەرمی؛ ئەمرۆ؛ ئەمروو؛ هەمروو؛ هەرمۆ؛ ئەمرووڵە؛ هرمیک؛ مرۆ؛ مرۆی؛ مروو؛ مروێ؛ مەروێ؛ مەروە؛ مووروو؛ موریە؛ مەروو؛ خەریبۆک؛ شکووک؛ گولاوی؛ گولاوەی: ١. پنچک یان دارێ بە ڕیشووی داچوو، گەڵای ساکار، ساف و ددانەدار، گوڵی سپی مەیلەو ئاڵەوە

٢. بـەری ئـەو داره کـە مێوەیـەکی بـنخـڕی درێژۆکەیە، زۆر جۆری هەیە و پـاییزان دەگـا ☰ ١و٢. گُلابی

▣ **هەرمێ ڕەشە:** ڕەشەهەرمێ؛ جۆرێک هـەرمێی دەنـک گـەورەی پاییزییـە ☰ نـوعی گلابـی پاییزی

**هەرمێ کرێوزێ:** جـۆرێ هـەرمێ کـە دەیکەنـە ترشی ☰ نوعی گلابی

**هەرمێ کێویلە:** کرۆسک ☰ گلابی جنگلی

**هەرمێ گولاوێ:** جۆرێ هەرمێ ☰ نوعی گلابی

**هەرمێ لاسورە:** جۆرێ هەرمێ ☰ نوعی گلابی

**هەرمێ مامسارمە:** جۆرێ هەرمێ ☰ نوعی گلابی

**هەرمێ هەڵوا:** جۆرێک هەرمێی تێکـوڵسـەوزە، کاتێ دەگا گۆشـتەکەی قـاوەیی دەبـێ، وەک هەڵوا ☰ نوعی گلابی

**هەرمێپشکوان / hermêpişk(i)wan/**: ناو. خاکەلێوە؛ مانگی سەرەتایی بەهار ☰ فروردین ماه

**هەرمێز / hermêz/**: ناو. شێواز ☰ اسلوب

**هەرمێشـک / hermêşik/**: نـاو. هەروێشـک؛ هەرووشک؛ هەڤریشک؛ هەورێشـک؛ هێروشـک؛ چنگاڵ؛ نانی دە ناو ڕۆن گوشراو ‹تێکی هەڵشێلە و بیکە هەرمێشک/ بیخۆ قازانجە بـۆ خـوێن و مێشـک «حەقیقی»› ☰ ترید نان در روغن

**هەرند / herind/**: ناو. ١. هـەرد؛ عـەرد؛ زەوی ٢. شوێنگێڕ؛ شۆنگر ☰ ١. زمین ٢. ردیاب

▣ **هەرنـدی کـەردش:** شـوێن دۆزینـەوە ☰ ردیـابی کردن

**هـەرنهـۆ / herniho/**: ئاوەڵـکار. ئێسـتاکە؛ ئێستاکوونێ ☰ هماکنون

**هەروا[1] / herwa/**: ☜ هەڵوا

**هەروا[2]**: ئاوەڵناو. بە خۆڕایی ☰ رایگان

**هەروا[3]**: ئاوەڵکار. ١. ☜ هەروەها ٢. بەم چەشنە؛ بەم جۆرە ‹لـە پێشـمانەوە هـەروا/ بەیـداخی زەفـەر دەڕوا «بێخـود»› ٣. بـێ پسـانەوە؛ لەسـەریەک ‹ئەپاڕایەوە و هەروا ئەینالان/ بە سۆز و گریان جەرگی ئەسـووتان «پیرەمێـرد»› ☰ ١. ☜ هـەروەهـا ٢. همچنین ٣. پیوسته

**هـەروایـی / herwayî/**: ئاوەڵـناو. ڕەمـەکی؛ هەڕەمەکی؛ گۆترە ☰ الکی

**هەروبار / her û bar/**: ناو. *[کینایە]* دار مێـوی لـە داریتر هالاو ☰ تاک پیچیده بر درخت دیگر

**هەروسا / herw(i)sa/**: ئاوەڵکار. ١. هەرئاوا ٢. ☜ هەروەها ☰ ١. همچنین ٢. ☜ هەروەها

**هەروش / herwiş/**: ناو. کرە؛ لـە دەسـتار کـراو ☰ کوبیده با دستاس

**هەرون / herun/**: ☜ هەرونە

**هەروند / herund/**: ☜ هەرونە

**هەرونە / herune/**: ناو. هەرون؛ هەروند: ١. شوێن پا ٢. جێگە؛ شوێن ☰ ١. رد پا ٢. جای

**هەروە / herwe/**: ☜ هەروەها

**هەروەتر / herwetir/**: ئاوەڵکار. ١. پتر لەوە کە بیر دەبەی ٢. هـەروەها؛ هـەروا ☰ ١. بـس بیشـتر ٢. همینطور

**هەروەک / herwek/**: ☜ هەروەکو

**هەروەکو / herwekû/**: ئامراز. هەروەک؛ تـەواو لـە گـوێن؛ لـە وێنـە؛ لـە چەشـنی ‹هـەروەکوو کـەو دەخوێنێ› ☰ همانندِ

**هەروەها / herweha/**: ئاوەڵکار. هـەروا؛ هەروسـا؛ هەروە؛ هەروها؛ هەرهۆ؛ ئابەم جۆرە ‹مەیتەر و زین و تەویلە، ئەی برا لازم نییە/ ئاخوڕ و ڕەشمە و لغـاوی هەروەها پێویست نییە «بێکەس»› ☰ همینطور

**هەروها / herw(i)ha/**: ☜ هەروەها

**هەروهەر / her û her/**: ئاوەڵکار. بێبڕانـەوە؛ دایم و دەرهەم ☰ همیشه

**هەروی / herwî/**: ☜ هەروێ

**هەروێ / herwê/**: ناو. هەروی؛ خەرۆێ؛ هەروێشە؛

کەروێشک؛ کەورێشک؛ کێروشک ☰ خرگوش

**هەروێشک** / herwêşk/: ☜ هەرمێشك

**هەروێشە** / herwêşe/: ☜ هەرویَ

**هەرۆ** / hero/: ☜ هەلّۆ

**هەرۆز** / heroz/: ☜ هەررۆژ

**هەروو** / herû/: ئاوەلّناو. هۆگر؛ ئۆگر؛ خۆپێ‌گرتوو ☰ خو گرفته

**هەرووشک** / herûşk/: ☜ هەرمێشك

**هەرووم** / herûm/: ئاوەلّناو. شەمووز؛ چەمووش؛ توخس؛ لەچەر؛ ڕەوەک؛ سڵ؛ تووش؛ تۆسن (بەتایبەت بۆ چوارپێیان) ☰ چموش

**هەرە**[1] / here/: ناو. ١. ڕیزە ئالووداری بە سەر پردلەی ژێر بەرداشدا ڕایەڵ کراو ٢. ڕیزە خشتی لە سەر لا داندراو بۆ ئیشک بوونەوە ٣. ماکەر؛ ولاغی مێوینە ☰ ١. ردیف تیر چوبی در سقف زیر سنگ آسیا ٢. ردیف خشتِ بر پهلو چیده شده برای خشک شدن ٣. ماچه اُلاغ

⊡ **هەرە کردن**: ڕیز کردنی خشتان لە سەر لا بۆ وشک بوونەوە ☰ ردیف کردن خشت‌ها بر پهلو به منظور خشک شدن

**هەرە**-[2]: پێشگر. زۆر؛ فرە؛ بەرتر و سەرتر ‹هەڵگورد لە چیا هەرەبەرزەکانی کوردستانە› ☰ بسیار

**هەرەئاسێ** / here'asê/: ئاوەلّناو. زۆر سەغڵەت و ئاستەنگ ☰ دشوارگُذر

**هەرەباش** / herebaş/: ئاوەلّناو. چاکتر لە گش ☰ بهترین؛ بهتر از همه

**هەرەبەرز** / hereberz/: ئاوەلّناو. لە گش بڵندتر ☰ بلندترین

**هەرەزاڵ** / herezał/: ئاوەلّناو. لە گشت دەسەڵاتدارتر ☰ مقتدرترین

**هەرەزل** / herezil/: ئاوەلّناو. ١. زەلامتر لە زەلامان ٢. گەورەی گەوران ☰ ١. گندەتر از همە ٢. بلندپایەترین

**هەرەزۆر** / herezor/: ئاوەلّناو. زۆرتر لە زۆر ☰ بیشترین

**هەرەزوو** / herezû/: ئاوەلّناو. هەرەزوو: ١. زووتر لە گش ٢. لە مێژینەتر لە ڕۆژگاری‌ڕابردوو ☰ ١. زودترین ٢. ماقبل تاریخ

**هەرەزینگ** / herezîng/: ناو. ئامرازی داغ کردن لە ئاسن؛ مۆری داغ کردن ☰ مُهر داغ‌گُذاری

**هەرەژ** / herej/: ناو. ١. هەرەش؛ نەخۆشیی هاری ‹سەگەکەمان تووشی هەرەژ بووە› ٢. [کنایه] بەلا؛ چۆرتم ‹یاخوا هەرەژ لە مالّت دوور بیَ› ☰ ١. هاری ٢. مُصیبت

**هەرەژنە** / herej(i)ne/: ناو. ئانیشک؛ ئەنیشک؛ بەندی نێوان قۆڵ و باسک ☰ آرنج

**هەرەس** / heres/: ناو. ١. هۆریەس؛ هەسەم؛ باسوو؛ کەوی؛ شاپە؛ شاپ؛ شەپە؛ سلخە؛ ئاشویت؛ کەویە بەفر؛ کۆمایەکی گەورە لە بەفر کە لە بەرزاییەوە بەر دەبێتەوە ‹هازەی ئەو دلّت دا ئەلەرزێنیَ/ هەرەس زۆر بەردی قورس ئەجوولێنیَ «پیرەمێرد»› ٢. ☜ هەرسی ☰ ١. بهمن ٢. ☜ هەرسی

⊡ **هەرەس بردن**: هەرەس هێنان؛ پسانی کێو یان ڕنوو لیَ دان ☰ ریزش کردن کوه یا بهمن

**هەرەس هاتن**: پسانی کلیلە بەفر ☰ ریزش کردن بهمن

**هەرەس هێنان**: ☜ هەرەس بردن

**هەرەسگا** / heresga/: ئاوەلّناو. هەرەسگە؛ هەرەسیا؛ جیَ مەترسی هەرەس لیَ کەوتن ☰ بهمنگیر

**هەرەسگر** / heresgir/: ناو. پاپەگیر؛ میچێکی لێژ بۆ پاراستنی جادە لە هەرەس ☰ بهمنگیر

**هەرەسگە** / heresge/: ☜ هەرەسگا

**هەرەسیا** / heresya/: ☜ هەرەسگا

**هەرەش** / hereş/: ☜ هەرەژ ـ١

**هەرەک**[1] / herek/: ناو. ١. ☜ حەرەکەت ٢. ئەستێرە هەرەگەشەکەی نزیک بە هەیڤ ☰ ١.

☜ حەرەکەت ٢. از ستاره‌های درخشان

**هەرەک[2]**: ئاوەڵکار. ١. هەرکام؛ هەر یەک لەوان ٢. بەڕاستی؛ بێگەمە ☰ ١. هر یک ٢. جدّی

**هەرەکان و مەرەکان / herekan û merekan/**: ناو. قامێکی منالانەیە لە جۆرێ گاڵتەدا دەیڵێن ☰ ترانه‌ای کودکانه

**هەرەکەت / herket/**: ☜ حەرەکەت

**هەرەمک / heremik/**: ئاوەڵناو. نەزۆک؛ نەزا ‹مخابن ئەو ژنە باشە هەرەمکە› ☰ نازا

**هەرەنگ / hereng/**: ناو. هەشەنگ؛ هێز؛ وزە ‹هەرەنگ لە دڵما نەما› ☰ توان

**هەرەوەڕ / herewer̄/**: ئاوەڵناو. هەڵەوەڕ؛ زۆربلێ؛ چەنەباز ☰ ژاژخا

**هەرەوەز / herewez/**: ناو. مەهبەرە؛ زبارە ‹هەرەوەزە، نان و بەزە› ☰ کار تعاونی

**هەرەوەزی / herewezî/**: ئاوەڵناو. بەکۆمەڵ؛ بە شێوەی گشت پێکەوە ‹وتی هەر کارێ گرانە/ هەرەوەزی بێ، ئاسانە «بێکەس»› ☰ جمعی

**هەرەی[1] / herey/**: ناو. فیز؛ دەعیە ☰ تکبُّر

**هەرەی[2]**: درەنگ؛ دێر وەخت ☰ دیروقت

⊡ **هەرەی کۆتەنە**: وەدرەنگ کەوتن ☰ دیر شدن

**هەرهاڵ / herhal/**: ئاوەڵکار. هەر چۆنێ بێت ☰ به هرحال

**هەرهلی / herh(i)lî/**: ئاوەڵناو. بڵ و زۆر گەیشتوو (میوە) ☰ آب‌لنبو (میوه)

**هەرهۆ / herho/**: ☜ هەرووەها

**هەرهە / herhe/**: ئاوەڵناو. هەتاهەتایی؛ دوور لە فەوتان ☰ جاوید

**هەری[1] / herî/**: ناو. ١. خوری؛ هری ٢. کوڵک؛ کووروو ☰ ١. پشم ٢. کُرک

**هەری[2]**: ئاوەڵناو. هەرە؛ زۆر ‹هەری مەزن› ☰ بسیار

**هەریر / herîr/**: ☜ حەریر

**هەریسە / herîse/**: ناو. هەلیسە؛ هەلیم؛ حەلیم؛ کەشکەک؛ چێشتی گەنمی کوتاو بە گۆشتەوە ☰ حلیم

**هەریل / herîl/**: ناو. جاو؛ خام؛ جۆرە پارچەیەکە لە پەمۆ دەیتەنن ☰ نوعی پارچه‌ی پنبه‌ای

**هەریمەندش / herîmendiş/**: ئاوەڵناو. زۆر پیر؛ زورهان؛ فریە وەتەمەن ☰ فرتوت

**هەرین[1] / herîn/**: ☜ هاڕین

**هەرین[2]**: ناو. ئەستێرە؛ هەسارە ☰ ستاره

**هەرینایش / herînayîş/**: چاوگ. کڕین؛ سانن؛ سەندن ☰ خریدن

**هەریەک / heryek/**: ☜ هەرکام

**هەریەکە / heryeke/**: جێناو. هەرکام ‹ئێمە جیا بووینەوە و هەریەکەمان وە لایەکدا چووین› ☰ هرکدام

**هەریەکی / heryekî/**: ئاوەڵکار. هەرگوویەو ☰ هریکی

**هەرێ[1] / herê/**: ناو. ١. ئارێ؛ بەڵێ ٢. ئێوارە وەخت ☰ ١. آری ٢. دم غروب

**هەرێ[2]**: ئاوەڵناو. بێئاگا ☰ بی‌خبر

**هەرێ[3]**: ئاوەڵکار. ١. ئاخۆ؛ ئەرێ ٢. بەڵێ؛ ئەرێ ٣. هەمیشە؛ دایم‌ودەرهەم ☰ ١. آیا ٢. بله؛ آری ٣. همیشه

**هەرێ[4]**: نزا. کەی وایە؛ وا نییە؛ ڕاس نییە ☰ نه چنین است

**هەرێز / herêz/**: ناو. فرێز؛ فریزوو؛ فرووزی؛ گیای چیمەن کە بژارێکی بەلایە ☰ فریس

**هەرێس / herês/**: ناو. بژا؛ بژاڵ؛ فرس؛ هەرێز ☰ علف هرز

**هەرێشامی / herêşamî/**: ناو. چەشنێ گوێرێژی سپی ڕەنگ ☰ نوعی الاغ سفیدرنگ

**هەرێم / herêm/**: ناو. ١. ناوچە؛ مەڵبەند ٢. هەوێرکە؛ وڵکە؛ بەشێ لە زەوینی دەوروبەری خانووبەرە، باخ یان جادە و هێڵی ئاسن یا

دیاردەگەلی سروشتی، وەک: زەریا، رووبار، لێرەوار و ... ٣. سنوور یان بواری شتێکی بەرێز یان پیرۆز (وەک: ئایین، قانوون و... کە دەست بۆ بردنی بە نارەوا دەزانن) ٤. دەوروبەری ئاوایی کە ناکێڵدرێ و ماڵی هەموانە ☰ ١. منطقه؛ ناحیه ٢و٣. حریم ۴. محدودەی روستا و اطراف آن

**هەرێمسری / herêmisrî**/: ناو. جۆرێ گوێرێژی ئاماڵ سپی ☰ نوعی اُلاغ سپیدفام

**هەرێهەرۆ / herêhero**/: نزا. وشەی گەف کردن لە پیاو ☰ کلمەی تهدید مرد

**هەرێ هەرێ / herê harê**/: ناوەڵکار. بەڵێ‌بەڵێ؛ ئاخۆ وابوو ☰ عبارت تأیید انکاری

**هەڕ[1] / heř**/: ناو. ١. ☜ **هەڕگ** ٢. خاک؛ خۆڵ ٣. زیقه؛ گریانی منداڵ ☰ ١. ☜ **هەڕگ** ٢. خاک ٣. صدای گریەی بچه

**هەڕ[2]**: دەنگەناو. سەڕە؛ زەڕەی کەر ☰ عر ـ عر الاغ

**هەڕا / heřa**/: ناو. غار؛ ڕا؛ قاچان ☰ دو؛ گریز

⊡ **هەڕا کردن**: غاردان؛ ڕاکردن ‹سا خەم هەڕا کا مل خۆی بشکێنێ/ سەد هەزار قەیسەر لەویا نانوێنێ «قانع»› ☰ دویدن؛ گریختن

**هەڕاج / heřac**/: ناو. حەراج؛ حەڕاج؛ هەڕاژ؛ هەرڕاج: ١. مەزات؛ مەزاد؛ فرۆشتنی شتێک بە فرەترین نرخی پێشنیارکراو لە لایەن کڕیارانەوە ٢. *[مەجاز]* کاری فرۆشتنی شت بە نرخێکی کەم ☰ ١. مُزایده ٢. حراج

⊡ **هەڕاج کردن**: هەرزان فرۆشتن ☰ حراج کردن

**خستنە هەڕاج**: شت فرۆشتن لە ناو خەڵکا کێ نرخی پتری پێ بدا بۆ ئەو بێ ‹کەری خستبووە هەڕاج/ فرۆشتی بێ خەرج و باج «پیرەمێرد»› ☰ بە مُزایده گذاشتن

**هەڕاجەبازاڕ / heřacebazař**/: ناو. حەراجە بازار ☰ بازار حراج

**هەڕاز / heřaz**/: ناو. هاتوچۆ لە جۆلانەدا ☰ نوسان تاب

**هەڕازگە / heřazge**/: ناو. جۆلانە؛ جۆلانێ؛ دەیدەک؛ دێلەکانێ ☰ تاب

**هەڕاژ / heřaj**/: ☜ **هەڕاج**

**هەڕافتن / heřaftin**/: چاوگ. ١. ڕووخان؛ ڕمیان؛ تێک ڕووخان ٢. ڕووخاندن؛ ڕماندن ☰ ١و٢. فروریختن (لازم و متعدی)

**هەڕاڵ / heřał**/: ناوەڵناو. *[بەلار]* بەرەڵڵا؛ خوێڕی ☰ بی‌بندوبار

**هەڕاڵە / heřałe**/: ناو. ١. شکۆفە؛ کڵووک؛ پشکۆژ ٢. هەلالە؛ جاڕ؛ بانگاواز٭ هەروەها: **هەڕاڵە کردن** ☰ ١. شکوفەی درخت ٢. جار

**هەڕانن / heřanin**/: چاوگ. سەڕانن؛ سەڕاندن زەڕاندن ☰ عرعر کردن

**هەڕا هەڕا / heřa heřa**/: ناو. تەقوودەو؛ تەقلەدەو؛ هەوڵ و تەقالا ☰ تکاپو

**هەڕد[1] / heřd**/: ☜ **ئارد**

**هەڕد[2]**: ناوەڵناو. هاڕاو؛ وردکراو ☰ خُرد شده

**هەڕدین / herdîn**/: چاوگ. لە بەریەک بڵاو بوون (بە هۆی زۆر کوڵان) ‹گۆشت هەڕدیە› ☰ لهیدن (در اثر زیاد پُختن)

**هەڕڕاج / heřřac**/: ☜ **هەڕاج**

**هەڕڕک / heřřik**/: دەنگ. وشەیەکە بۆ سەیرمان و واق ورمان ☰ وه

**هەڕڕە / heřře**/: ناو. قوڕ؛ هەڕ؛ هەڕی؛ حەڕی؛ هەڕگ ☰ گِل

**هەڕستن / heřistin**/: چاوگ. پاڵ وێکدان؛ لێک جووت بوون بە توندی؛ پێکەوە لکانی بێ نێوان ☰ مُحکم به هم چسبیدن

**هەڕش / heřş**/: ناو. ١. فێڕوو؛ خۆڕایی ٢. تەلاس؛ مەزەختی بەفێڕوو ☰ ١. عمل هدر دادن ٢. اسراف

**هەڕشان / heřşan**/: چاوگ. ١. لە بەریەک بڵاو بوون لە بەر کوڵان ٢. پلیخانەوە ☰ ١. از هم

پاشیدن ٢. لە شدن

**هەڕشاندن** / heřşandin/: چاوگ. هەڕشتن؛ هەڕشین: ١. لە بەریەک بڵاو کردن ٢. پلیخاندنەوە ٣. هەرژاندن؛ لە ناو بردن ☰ ١. از هم پاشیدن ٢. لە کردن ٣. از بین بردن

**هەڕشتن** / heřiştin/: ☜ **هەڕشاندن**

**هەڕشتە** / heřişte/: ناو. ڕشتە؛ ڕستە ☰ رشتە

**هەڕشتی** / heřiştî/: ئاوەڵناو. ١. ڕیزاڵبوو ٢. پلیخاو؛ دەست لە یەک بەرداو ☰ ١. از هم پاشیده ٢. لە شده

**هەڕشین** / heřşin/: ☜ **هەڕشاندن**

**هەڕفان** / heřfan/: ☜ **هەڕفتن**

**هەڕفاندن** / heřfandin/: چاوگ. هەرڤاندن؛ هەڕفتاندن؛ ڕماندن؛ تێک ڕووخاندن ☰ خراب کردن

**هەڕفتاندن** / heřiftandin/: ☜ **هەڕفاندن**

**هەڕفتن** / heřiftin/: چاوگ. هەڕفان؛ هەرفتین؛ تێک ڕووخان ☰ ریزش کردن

**هەڕفتی** / heřiftî/: ئاوەڵناو. تێکڕووخاو ☰ ریزش کرده

**هەڕفین** / heř(i)fin/: چاوگ. هەرفین؛ ڕووخان؛ هەڕفتن ☰ ریزش کردن

**هەڕک**[١] / heřik/: ناو. ١. ☜ **حەرەکەت** ٢. ☜ **هەڕگ**

**هەڕک**[٢]: دەنگ. حەک؛ وتەی سەیر مان ☰ وه

**هەڕکاندن** / heřkandin/: چاوگ. ١. بزواندن؛ بزاوتن ٢. وەڕێ خستن ‹مە ئاڤ بە سەر باخچەڤە هەڕکاند› ☰ ١. جُنباندن ٢. راه انداختن

**هەڕکیشە** / heřkîşe/: ناو. ڕکێشە؛ ڕەکێشە ☰ بارهنگ

**هەڕکین** / heřkîn/: چاوگ. ١. بزووتن؛ جووڵان ‹ڤێ بهەڕکێنە› ٢. وەڕێ کەوتن ‹ئەڤ چەم کوڤە دهەڕکە؟› ☰ ١. حرکت کردن ٢. راه افتادن

**هەڕکێڵ** / heřkêł/: ☜ **هەڕی کێڵ**

**هەڕگ** / heř(i)g/: ناو. هوڕ؛ هوڕی؛ هەرە؛ هەڕ؛ هەرک؛ هەرە؛ هەڕی؛ قوڕ؛ حەڕی ☰ گِل

▣ **هەڕگ وە بان سەر:** /کنایە/ کڵۆڵ؛ چارەڕەش؛ ڕۆژڕەش ☰ بدبخت

**هەڕگ وە بان قنگ:** /کنایە، پلار/ بێئاگا؛ بێخەبەر و بێمبالات سەبارەت بە ڕووداوان ☰ غافل

▣ **هەرگ پێوان:** /کنایە/ هەرگ شێلان؛ دەردیسەر و گێچەڵ ساز دان ☰ توی هچل افتادن

**هەڕگ چوونە سەرا:** ☜ **هەڕگ وە سەر بون**

**هەڕگ شێلان:** ☜ **هەڕگ پێوان**

**هەڕگ کردنە سەرا:** /کنایە/ ١. تووشی فەرتەنە کردن ٢. لە ناچاری کارێکی ناخۆش کردن ☰ ١. توی دردسر انداختن ٢. خاکی بە سر کردن

**هەڕگ وە سەر بون:** /کنایە/ هەڕگ چوونە سەرا؛ تووشی گێچەڵ هاتن ☰ خاک بر سر شدن

**هەڕگاو** / heřgaw/: ناو. قوڕاو ‹لافاو کووچەی جەستەی زووخالی/ هەڕگاو هەستی هەرچێ بوو ماڵی «مەولەوی»› ☰ گِلوشُل

**هەڕگبەسەر** / heřigbeser/: ☜ **بەدبەخت**

**هەڕگکاری** / heř(i)gkarî/: ناو. ١. کاری کایە کردن بە هەڕگ ٢. هەرەکاری؛ کاری ماڵ کردنەوە ٣. کاری ماڵ تەعمیر کردن ☰ ١. گِلبازی ٢. خانەسازی ٣. تعمیر خانه

▣ **هەڕگکاری کردن:** قوڕەکاری کردن؛ خانوو ساز کردن؛ ماڵ کردنەوە ☰ خانه ساختن

**هەڕگوەسەر** / heřigweser/: ☜ **قوڕبەسەر**

**هەڕگین** / heřgîn/: ئاوەڵناو. دروسکراو لە قوڕ ☰ گِلین

**هەڕگینە**[١] / heřgîne/: ناو. سواڵەت ☰ سُفال

**هەڕگینە**[٢]: ئاوەڵناو. لە حەڕی چێکری ☰ گِلین

**هەڕلە** / heřle/: ناو. پیرۆشک؛ خلێرە؛ خلێرە ☰

خرخاکی

**هەڕمان / heřman/**: چاوگ. ڕمان؛ ڕمیان؛ ڕووخان؛ هەڕفتن ☰ فروریختن

**هەڕماندن / heřmandin/**: چاوگ. ١. بێبەش کردن لە ماف ٢. پیس کردن ‹چێڵەکا فیژۆکەر گارانەکی دەهەڕمینە «مەسەل»› ٣. بە خەسار دان ‹تەبەرەی خۆ هەڕماند› ☰ ١. محروم کردن ٢. آلوده کردن؛ کثیف کردن ٣. هدر دادن

**هەڕمتی / heřm(i)tî/**: ئاوەڵناو. ڕووخاو؛ ڕمیاو؛ هەڕفتی ☰ فروریخته

**هەڕمی / heřmî/**: ☜ هەڕمتی

**هەڕمین / heřmîn/**: چاوگ. ١. مان گرتن؛ گە گرتن؛ جەنە گرتن ٢. بە فیڕۆ چوون ٣. ڕووخان؛ ڕمان ☰ ١. اعتصاب کردن ٢. بە هدر رفتن ٣. فروریختن

**هەڕمێن / heřmên/**: ناو. ڕمێن؛ برەو ☰ رواج

**هەڕن[١] / heřin/**: چاوگ. ڕۆیین؛ چوون؛ چێین ☰ رفتن

**هەڕن[٢]**: ناو. خۆڵاوی؛ خوەڵاوی ☰ خاک‌آلود

**هەڕنین / heřnîn/**: چاوگ. هەڕمین؛ مان گرتن ☰ اعتصاب کردن

**هەڕوپف[١] / heř û pif/**: ناو. *[کنایە]* کەفوکوڵ؛ تووڕە بوونێ کە زوو خەلاس دەبێ ‹گوێ مەدەیە تووڕەیی ئەو هەر هەڕوپفێکە دەبڕێتەوە› ☰ خشم زودگذر

**هەڕوپف[٢]**: دەنگەناو. دەنگی پشیلە لە بە یەکا چوونا ☰ صدای گربە هنگام دعوا

**هەڕوگیڤ / heř û gîv/**: ناو. گەف؛ هەڕەشە و گوڕەشە ☰ تهدید

**هەڕووەل / heř û wel/**: ناو. خاک‌وخۆڵ؛ تۆزوخۆڵ ☰ گردوخاک

**هەڕوهەراو / heř û heraw/**: ئاوەڵناو. فش‌وفۆڵ؛ دەلپ؛ زۆر گەورە، بە تایبەت جل و بەرگ ☰ گل‌وگشاد

**هەڕۆ[١] / heřo/**: ئاوەڵکار. تەنیا؛ بە تەنێ ‹هەر چەندە هەڕۆ خۆشتان تێی دەگەن/ وەرن یا هەڕۆ یا مەڕۆی لێ بکەن «پیرەمێرد»› ☰ فقط

**هەڕۆ[٢]**: دەنگ. هەڕێ؛ هێڕێ؛ دەرەوە؛ وتەیەک بە مانا گوم بە ☰ هِرّی

**هەڕۆ لێ کردن**: وە دەر نان؛ دەرکردن ‹هەر چەندە هەڕۆ خۆشتان تێی دەگەن/ وەرن یا هەڕۆ یا مەڕۆی لێ بکەن «پیرەمێرد»› ☰ بیرون کردن

**هەڕۆ[٣]**: ☜ هەڕڕۆژ

**هەڕۆکە / heřoke/**: ناو. چەتە؛ ڕێگر ☰ راهزن

**هەڕۆڵشە / heřołşe/**: ناو. کەروێشک ☰ خرگوش

**هەڕۆنن / heřonin/**: چاوگ. زەڕاندن؛ سەڕاندن ☰ عرعر کردن

**هەڕە[١] / heře/**: ناو. ١. ئەڕە؛ مشار؛ تیغی ددانەدار بۆ دار برینەوە ٢. تیغە؛ دیواری ناسکی نێوان دوو دیو ٣. فەنەر؛ خشتی لە سەر یەک هەڵچنراوی کوورەخانە ٤. ☜ هەڕگ ☰ ١. ارّه ٢. تیغه ٣. فنر آجر ٤. ☜ هەڕگ

▣ **هەڕە کردن**: بە مشار برینەوە ☰ ارّه کردن

**هەڕە[٢]**: دەنگەناو. سەڕە؛ زەڕە؛ دەنگی کەڕ ☰ عرعر

**هەڕەپۆپە / heřepope/**: ئاوەڵناو. پۆپەمشار؛ بە پۆپەی قیت و ددانەدارەوە (کەڵەباب و ...) ☰ تاج ارّەای (خروس و ...)

**هەڕەت / heřet/**: ناو. ١. دەرفەت؛ کێس ٢. جەنگە؛ کاتی زۆر بوونی شتێ ‹هەڕەتی جوانیم بوو؛ هاوین هەڕەتی میوەیە› ☰ ١. فُرصت ٢. عُنفوان

**هەڕەزاڵە / heřezałe/**: ناو. ڕێزەڵە؛ گیایەکە ☰ گیاه تاجریزی

**هەڕەزان / heřezan/**: ناو. جۆلانە؛ جۆلانێ ☰ تاب

**هەڕەشە / heřeşe/**: ناو. گەف؛ هەڕوگیڤ ☰ تهدید

**هەڕەشەکەر / heřeşeker/**: ئاوەڵناو. گەفۆک ☰

تهدید کننده

**هەڕەشەوگوڕەشە / heřeşe w guřeşe/**: ناو. گفوگەف؛ هەڕوگیف 🇮🇷 تهدید و ارعاب

**هەڕەشیان / heřeşyan/**: ☜ هەڕەشین

**هەڕەشین / heřeşîn/**: چاوگ. هەڕەشیان؛ لە نێو چوون؛ خراپ بوون 🇮🇷 از میان رفتن

**هەڕەکاری / heřekarî/**: ☜ هەڕیکاری

**هەڕەکە / heřeke/**: ☜ حەرەکەت

**هەڕەکەت / heřeket/**: ☜ حەرەکەت

**هەڕەکیان / heřekyan/**: چاوگ. داگیران و لە کار کەوتنی ئەندامانی لەش لە بەر گوشار و کاری زۆر سەخت 🇮🇷 خسته و کوفته شدن

**هەڕەکیاوی / heřekyawî/**: ناو. جەمامی؛ ڕەق و ئاوساویی ئەندام 🇮🇷 کوفتگی

**هەڕەم / heřem/**: ناو. ١. ژووری ئەندەرون ٢. *[کینایە]* ژن؛ هاولفی مێرد 🇮🇷 ١. اندرونی ٢. عیال

**هەڕەماسی / heřemasî/**: ناو. هاڕەماسی؛ هارەماسی؛ دڕەماسی؛ مشارە؛ جۆرێک ماسی کە دەمی لە دوو ئێسکی وەک هەرە پێکهاتووە 🇮🇷 ارّەماهی

**هەڕەمدار / heřemdar/**: ئاوەڵناو. خێزانبار؛ منداڵبار؛ ژن و منداڵدار 🇮🇷 عیالوار

**هەڕەمە[1] / heřeme/**: ناو. ١. جەنگە؛ هەڕەت ٢. برەو؛ پەرە ٣. پڕایی خەڵک و کۆمەڵ ٤. لەز؛ پەلە 🇮🇷 ١. عنفوان ٢. رواج ٣. انبوهی مردم ۴. عجله

**هەڕەمە[2]**: ئاوەڵناو. ١. گۆترە؛ برە؛ بێ‌حیساب؛ بێ سەرەوبەرە ‹هەموو کاری هەڕەمەیە› ٢. تێکەڵاو؛ تێکەڵکراو ‹گەنم و دانەوێڵە› 🇮🇷 ١. بی حساب و کتاب ٢. قاطی (گندم و غلات)

**هەڕەمە[3]**: ئاوەڵکار. گۆترە؛ بە برە؛ بێ هەڵسەنگاندن ‹هەڕەمە دەیفرۆشت› 🇮🇷 درهم

**هەڕەمەکاری / heřemekarî/**: ناو. گۆترەکاری؛ کاری بیرلێنەکراوە و نەگونجاو 🇮🇷 کار نسنجیده

**هەڕەمەکی[1] / heřemekî/**: ئاوەڵناو. بە گۆترە؛ هەروایی ‹کاری هەڕەمەکی› 🇮🇷 الکی

**هەڕەمەکی[2]**: ئاوەڵکار. بە گۆترە؛ هەروا ‹هەڕەمەکی کار دەکا› 🇮🇷 الکی

**هەڕەمەگوڵخار / heřemegułxar/**: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* تێکەڵ ـ پێکەڵ؛ شەقلێ ـ پەقلێ؛ تەڤلهەڤ 🇮🇷 قاطی ـ پاتی

**هەڕەهەڕ / heřeheř/**: ناو. گورە گوڕ؛ چەقەچەقی شەڕاوی 🇮🇷 دادوقال

**هەڕی / heřî/**: ☜ هەڕگ

**هەڕیبسەر / heřîbiser/**: ئاوەڵناو. *[کینایە]* قوڕبەسەر؛ خاکەسەر؛ بەەزمان ‹ڕێوی هەڕیبسەر› 🇮🇷 بیچارە

**هەڕیکار / heřîkar/**: ناو. کەسێ کە کاری قوڕ دەکا 🇮🇷 گِلکار

**هەڕیکاری / heřîkarî/**: ناو. هەڕەکاری؛ قوڕەکاری؛ هەڕەکاری 🇮🇷 گِلکاری

**هەڕیکەر / heřîker/**: ناو. کەسێ قوڕ دەگرێتەوە و دەیشێلێ 🇮🇷 گِلسرشت

**هەڕیکێل / heřîkêl/**: ناو. هەڕکێل؛ کەسێ کە تۆی بە زەمینی تەڕەوە کردووە و جووتی دەکا 🇮🇷 کسی که بر زمین مرطوب بذر پاشیده و شخم می‌زند

**هەڕیوەسەر / heřîweser/**: ☜ قوڕبەسەر

**هەڕێن / heřên/**: ئاوەڵناو. خۆڵاوی؛ خوەڵاوی 🇮🇷 خاک‌آلود

**هەز / hez/**: ☜ حەز

⊡ **هەز ژێ کرن**: ١. دڵ پێ دان؛ دڵ دانیان ٢. ئارەزوو کردن؛ بە دڵ داوا کردن 🇮🇷 ١. دل باختن ٢. آرزو کردن

**هەز کرن**: ☜ حەز کردن

**هەزار[1] / hezar/**: ناو. هازار؛ هزار؛ هنزار؛ هۆزۆر؛ هەنزار؛ دەجار سەت؛ دەچەلان سەت؛ ژمارەی سەرەکی پاش نۆسەد و نەوەد و نۆ و پێش هەزار

و یەک ☰ هزار

**هەزار**[2]: ناوەلناو. هازار؛ هزار؛ هنـزار؛ هۆزۆر؛ هەنزار: ١. یەکێک زۆرتر لە نۆسەد و نەوەد و نۆ دانـە ٢. هـەزارەم؛ هـەزاروم ٣. *[کینایە]* هـەزارا؛ هـەزاران؛ هەزارانهەزار؛ یەکجار زۆر؛ بێحەد ‹کـورد هـەزار «هەزاری»ی هەبێ هەر کەمە› ☰ ١تا٣. هزار

**هەزارا** / hezara/: ☜ **هەزار**[2]**ـ٣**

**هەزاران** / hezaran/: ☜ **هەزار**[2]**ـ٣**

**هەزارانهەزار** / hezaranhezar/: ☜ **هەزار**[2]**ـ٣**

**هەزاربەهـــــەزار** / hezarbehezar/: نـــــــاو. هەزارەوهەزار؛ شاخی زۆر بـەرز و ئاسـێ ☰ کـوە صخرەای بسیار بلند

**هەزارپا** / hezarpa/: ☜ **هەزارپێ**

**هەزارپرتی** / hezarpirtî/: ☜ **هەزارتوێ**[1]

**هەزارپۆپ** / hezarpop/: ☜ **هەزارپۆپە**

**هەزارپۆپنە** / hezarpopne/: ☜ **هەزارپۆپە**

**هەزارپۆپـــە** / hezarpope/: نـــاو. هــــەزارپۆپ؛ هەزارپۆپنـە؛ پۆپـەپان (کەلەشـێر) ☰ تـاج پهـن (خروس)

**هەزارپیشە**[1] / hezarpîşe/: ناو. جـۆرێ سـندووقی چاوە ـ چـاوەکراوە بـۆ جـێ کەلپـەلی کـار یـان تۆشەی سەفەر ☰ هزاربیشە

**هەزارپیشە**[2]: ناوەلناو. *[کینایە]* تایبەتمەندی کەسـێ کە سەری لە زۆرکاران دەرچێ ‹پێت وابـوو هـەژا، هەزارپیشە/ مەی سـوورە ڕژا لـە زارەشیشـە «مـەم و زین، هەژار»› ☰ همەفن حریف

**هەزارپێ** / hezarpê/: ناو. هەزارپا؛ زێلوو؛ زیڤزیڤ؛ زیڤزیڤە؛ زیڤە؛ زیڤ؛ زۆڤ؛ شـەمار؛ شـەحرمەحر؛ خشخشـۆک؛ کشـک؛ کشـگ؛ خشـک؛ خشـکە؛ خشگ؛ خشی؛ مارەزیو؛ مارەزیلە؛ زیور؛ گوەسـم؛ پرپە؛ پرپا؛ کرمێکی درێژی گـرێ ـ گـرێ، کـە لـە هەر گرێیکەوە یەک یان دوو جووت پا دەرهاتووە ☰ هزارپا

**هـــەزارتوێ**[1] / hezart(i)wê/: نـــاو. هــــەزارتوێخ؛ هـەزارلۆ؛ هـەزارپرتی؛ هـەزارلوێ؛ هەزارلۆخانـە؛ هەزارلۆغانە؛ کلاوقازی؛ ئەندامێکی توێ لـە سـەر توێیە لە ناو زگی حەیواندا ☰ هزارلای سیرابی

**هـەزارتوێ**[2]: ناوەلـناو. هــــەزارتوێخ؛ هــەزارلۆ: ١. خاوەن توێی زۆر ٢. *[کینایە]* دەبنەوەبڕ؛ دەخـەس؛ نهـێنبڕ ☰ ١. تودرتو ٢. تودار

**هەزارتوێخ** / hezart(i)wêx/: ☜ **هەزارتوێ**

**هەزارڕەگ** / hezarřeg/: ناوەلـناو. *[پلار]* بیـژ؛ پـیچ؛ زۆڵ؛ ناڕاست ☰ حرامزادە

**هەزارگەز** / hezargez/: ناو. هزارگەز؛ گیایەکـە بـۆ دەرمان دەشێ ☰ گیاە هزارگوشان

**هەزارلوێ** / hezarl(i)wê/: ☜ **هەزارتوێ**[1]

**هەزارلۆ** / hezarlo/: ☜ **هەزارتوێ**

**هەزارلۆخانە** / hezarloxane/: ☜ **هەزارتوێ**[1]

**هەزارلۆغانە** / hezarloğane/: ☜ **هەزارتوێ**[1]

**هـــــەزارودوولایی** / hezar û dûlayî/: ☜ **هەزارویەکلایە**

**هەزارویەکلایـــە** / hezar û yeklaye/: نـــاو. هەزارودوولایی؛ هەزارویـەکلایـی؛ هـاتوچـۆی قیچەلـفاچی کەروێشـک لـە سـەر بـەفر بـۆ شوێنەونکە ☰ رفت و برگشت خرگـوش روی بـرف برای رد گم کردن

**هەزارویـــەکلایی** / hezar û yeklayî/: ☜ **هەزارویەکلایە**

**هەزارە** / hezare/: ناو. ١. ☜ **هەزارویەکلایـە** ٢. بەردی قیتی لێواری حەوز ٣. لێواری تاقـەی نـاو دیوار ٤. دۆخی خەو زڕان و خەیالات کردنی نـاو جێگە ٥. ڕێوڕەسمێک بـە بۆنـەی هـەزارەمین سالەهاتی ڕووداوێـک ٦. مـەودای کـاتی هـەزار سالە ‹هەزارەی یەکەمی پێش لە زایین› ☰ ١. ☜ **هەزارویەکلایە** ٢. سـنگ برجسـتە لبـەی حـوض ٣. لبەی طاقچە ۴. حالت بدخواب شدن ۵و۶. هزارە

⊡ **هەزارە کردن**: ١. خەیالات کردنی خەو زڕاو ٢. شوێنەونکە کردنی کەروێشک لە سەر بەفر ☰ ١. به فکر و خیال فرورفتن آدم بدخواب ٢. رد گم کردن خرگوش روی برف

**هەزارەزیلە / hezarezîle/**: ناو. ئـاپۆرەی تێکەڵوپێکەڵ ‹وا ئێمە لە بارزان قەتیس ماوین و بەو هەزارەزیلە جاش و عەسکەر و تۆپ و تەیارە، دەورە دراوین. چێشتی مجێور، «هەژار»› ☰ ازدحام

**هەزارەک / hezarek/**: ☜ **هەزاریەك**

**هەزارەم / hezarem/**: ئاوەڵناو. بە ڕیز و پلە و پایەی هەزارەوە ☰ هزارم

**هەزارەمی / hezarmî/**: جێناو. ئەوەی کە لە جێگای هەزارمدایە ☰ هزارمی

**هەزارەمین / hezaremîn/**: ئاوەڵناو. بە ڕیز و پلە و پایەی هەزارەمەوە ☰ هزارمین

**هەزارەوهەزار / hezarewhezar/**: ☜ **هەزاربەهەزار**

**هەزاریەک / hezaryek/**: ناو. هەزارەک؛ لە هەزار پاژ پاژێک ☰ یک هزارم

**هەزاز / hezaz/**: ناو. ١. هەرەسی چیا و کەندال ٢. ڕەوتی رووخانی کێو ٣. جۆرێ نەخۆشی وەک گولی ☰ ١. گُسستگی کوه و گودال ٢. ریزش کوه ٣. نوعی بیماری شبیه جُذام

**هەزان / hezan/**: چاوگ. نزم بوون؛ نەوی بوون ☰ پست بودن

**هەزاندن / hezandin/**: چاوگ. ١. ڕاوەشاندن؛ وە لەرەلەر خستن؛ هەژاندن ٢. تێ‌نان؛ تێ‌ڕاکردن ☰ ١. تکان دادن ٢. سپوختن

**هەزاوا / hezawa/**: ☜ **هەزوا**

**هەزبۆ / hezbo/**: ☜ **هەزبێ**

**هەزبە / hezbe/**: ☜ **هەزبێ**

**هەزبیلەکێویلە / hezbîlekêwîle/**: ☜ **هەزبیەکێویلە**

**هەزبیە / hezb(i)ye/**: ناو. ١. گیای بۆنخۆشی وشکەوەکراو بۆ ناو چێشت ٢. تاقمە گیایەکی گەلاوردی تیژی بۆنخۆشن، وشک دەکرێن و دەخورێن. وەک: ناعنە؛ مەرزە؛ مەرسە و ... ☰ ١. سبزی خشک آشی ٢. گیاهان خانوادەی نعنا

**هەزبیەکێویلە / hezb(i)yekêwîle/**: ناو. ئەزبێ‌کێویلە؛ هەزبیلەکێویلە؛ نەعناکێویلە ☰ آویشن کوهی

**هەزبێ / hezbê/**: ناو. ئەزبۆلە؛ ئەزبێ؛ هەزبۆ؛ هەزوە؛ هەزوێ؛ هەزبە؛ هەوشین؛ هەویشن ☰ آویشن

**هەزکەر / hezker/**: ئاوەڵناو. ١. ئەویندار؛ دڵدار؛ دلکەتی ٢. بەئاوات؛ بەتاسە ☰ ١. عاشق ٢. آرزومند

**هەزم / hez(i)m/**: ناو. ئەزم؛ هەرسک؛ ڕەوتی تاوانەوەی خواردن لە ورگدا ☰ هضم

**هەزمان / hezman/**: ناو. زمان؛ زبان؛ زوان ☰ زبان

**هەزن / hezn/**: ناو. خەم؛ ناهومێدی ☰ حُزن

**هەزوا / hezwa/**: ناو. هەزاوا؛ عەزوا؛ ئەزوا؛ تالیشاری ☰ الوا؛ صبر

**هەزوە / hezwe/**: ☜ **هەزبێ**

**هەزوێ / hezwê/**: ☜ **هەزبێ**

**هەزوێلە / hezwêle/**: ناو. وشکە گیا و شتی بۆن و تام خۆشکەری چێشت ☰ ادویه

**هەزەخ / hezex/**: ئاوەڵناو. ١. موبارەک؛ پیرۆز ٢. بەڕێژەو؛ بەحاسڵ ☰ ١. مُبارک ٢. پُردرآمد

**هەزەی / hezey/**: ئامراز. وەکوو؛ وەکی؛ لە گوێن ☰ مانندِ

**هەزهەزاییش / hezhezayîş/**: چاوگ. هەڵوەرین لە بەر ڕزیوی ☰ فروریختن از پوسیدگی

**هەزیا / hezya/**: ناو. زەها؛ حەزیا ☰ اژدها

**هەزیر / hezîr/**: ناو. بەراورد؛ خەمڵ؛ ڕەوتی قرسان ☰ تخمین

⊡ **هەزیر کرن**: قرساندن؛ خەمڵ کردن؛ بەراوەرد

کردن 🇮🇷 تخمین زدن

**هەزیران** / hezîran/: ناو. ۱. ☜ **حوزەیران** ۲. حەیزەران؛ قامیشەهیندی 🇮🇷 ۱. ☜ **حوزەیران** ۲. چوب خیزران

**هەزیرانی** / hezîranî/: ناو. جۆری هەرمێ 🇮🇷 نوعی گلابی

**هەزین** / hezîn/: ☜ **هژان**

**هەزینگ** / hezînig/: ناو. ڕاپەڕ؛ شنگڵ؛ کاری لە خۆ نەوین بۆ کار ‹هەزینگ دا خۆ› 🇮🇷 عمل تکان به خود دادن در کار

**هەزێلک** / hezêlik/: ☜ **هەرزاڵ**

**هەژ**[1] / hej/: ناو. ۱. ☜ **حەز** ۲. قاقڕ؛ دەشتی وشکارۆ ۳. هەش؛ خم؛ خوم؛ گیایەکە بۆ ڕەنگی شین دەکار دەکرێ ‹دادی ئایینمان لە دەست مەینۆشی و ڕەشپۆشیە/ هەژ بە سەر ئەو جەژنە یا سەرخۆشی یا سەرخۆشییە «پیرەمێرد»› 🇮🇷 ۱. ☜ حەز ۲. صحرای خشک ۳. خُم

**هەژ**[2]: ئاوەڵناو. وشک 🇮🇷 خُشک

**هەژار** / hejar/: ئاوەڵناو. ۱. ژار؛ بێچارە ‹جەنابی حەپسە خان، تەشریفی ڕۆیی/ شکا پشتی فەقیران و هەژاران «بێخود»› ۲. نەدار؛ بەلەنگاز؛ لانەواز ‹پیاوی هەژار، پیاوی بێهێز، با چاکیش بێ، با پاکیش بێ، بەرچاو نییە، کەس هەژاری پێ پیاو نییە «هەژار، *چوار نامیلکە*»› ۳. جێ بەزەیی ‹ئەگەر تە قەولت سادقۆ، پێسەو یاران موافقۆ/ وەس دە جەفا وە عاشقۆ، فەقیرەنێ، هەژارەنێ «سەیدی»› 🇮🇷 ۱. بیچارە ۲. فقیر ۳. مظلوم

⊡ **هەژار کەوتن**: ۱. بێچارە بوون ۲. نەدار بوون 🇮🇷 ۱. بیچارە شدن ۲. فقیر شدن

**هەژارخانە** / hejarxane/: ناو. ۱. فەقیرخانە؛ ماڵێ کە خەڵکی هەژار و بێنانی لێ بەخێو دەکەن ۲. *[کینایە]* ماڵی فەقیرانەی بێ دڵدار تێدا ‹لەم هەژارخانەیە بمهێنە دەرێ!/ بمبە دەشتودەرێ! بمگێڕە سەرێ! «هەژار، *بۆ کوردستان*»› 🇮🇷 ۱. نواخانە ۲. خانەی حُزن

**هەژارەتی** / hejaretî/: ناو. کار و کسمی فەقیرانە 🇮🇷 کسب فقیرانە

**هەژاری** / hejarî/: ناو. ۱. نەداری؛ ژاری ۲. هەژارەتی؛ تەقالای فەقیرانە 🇮🇷 ۱. فقیری ۲. کسب فقیرانە

**هەژالە** / hejale/: ناو. گیای بێکەڵک کە دەبێ بژار بکرێ 🇮🇷 گیاه هرزە

**هەژاڵ** / hejał/: ناو. لکەدار بە گەڵا و پەڕژەوە 🇮🇷 شاخەی با برگ و جوانە

**هەژان** / hejan/: چاوگ. هێژیان؛ ڕاتەکان؛ شەکانەوە 🇮🇷 تکان خوردن

**هەژاندن** / hejandin/: چاوگ. هژاندن؛ هەژکاندن: ۱. ڕاژاندن؛ شەکاندنەوە ۲. ژەندنی مەشکە ۳. ڕاوەشاندن؛ ڕاتڵەکاندن 🇮🇷 ۱. جُنباندن ۲. بە هم زدن مشک ۳. شدید تکان دادن

**هەژدان** / hejdan/: ☜ **جۆ هەژدان**

**هەژدە**[1] / hejde/: ناو. هژدە؛ هێژدە؛ هەجدە؛ هەیژدە؛ هەستێس؛ هەشتێس؛ هەیشتێس؛ حەژدە؛ ژمارەی سەرەکی پاش حەفدە و پێش نۆزدە 🇮🇷 هجدە

**هەژدە**[2]: ئاوەڵناو. هژدە؛ هێژدە؛ هەجدە؛ هەیژدە؛ هەستێس؛ هەشتێس؛ هەیشتێس: ۱. یەکێک زۆرتر لە حەڤدە دانە ۲. هەژدەهەم؛ هەژدەیەم 🇮🇷 ۱و۲. هجدە

**هەژدەرهەژدەر** / hejderhejder/: ئاوەڵکار. هەوڵ؛ بە پەلە (قسە) ‹هەژدەرهەژدەر قسەی لە دەم دەردەچێ› 🇮🇷 شتاب‌آمیز (سخن)

**هەژدەمین** / hejdemîn/: ☜ **هەژدەهەمین**

**هەژدەها** / hejdeha/: ☜ **ئەژدیها**

**هەژدەهەم** / hejdehem/: ئاوەڵناو. هەژدەیەم؛ هەجدەهەم؛ هێژدەهەم؛ هێژدەهی؛ هەشتێسن؛

هەشتێسنە؛ هەیشتێسن؛ بە ڕیز، پلە یان پێگەی هەژدەهەمەوە ☚ هجدهم

**هەژدەهەمی** / hejdehemî/: جێناو. هەژدەیەمی؛ لە ڕیز، پلە یان پێگەی هەژدەهەمیدا ☚ هجدهمی

**هەژدەهەمین** / hejdehemîn/: ئاوەڵناو. هەژدەمین؛ هەجدەهەمین؛ هەژدەهی؛ بە ڕیز، پلە و پێگەی هەژدەهەمەوە ☚ هجدهمین

**هەژدیەم** / hejdeyem/: ☜ هەژدەهەم

**هەژدیەمی** / hejdeyemî/: ☜ هەژدەهەمی

**هەژدیها** / hejdîha/: ☜ ئەژدیها

**هەژڤاندن** / hejvandin/: چاوگ. ترساندن؛ تۆقاندن؛ زەنەق بردن ☚ ترساندن

**هەژڤین** / hejvîn/: چاوگ. ترسان؛ ترسیان ☚ ترسیدن

**هەژقاندن** / hejqandin/: چاوگ. وە دڵەتەپێ خستن؛ شێواندن (کەسێ) ☚ مُضطرب کردن

**هەژقین** / hejqîn/: چاوگ. شێویان و کەوتنە دڵەخورپێ ☚ مُضطرب شدن

**هەژکاندن** / hejkandin/: ☜ هەژاندن

**هەژک و بەژک** / hejik û bejik/: ناو. هەژک و پەژک؛ هەژگ و بژاڵ؛ هەژگ و پیژاڵ؛ چرپی و چاڵ؛ لق‌وپۆی وشکەوەبووی دار ☚ شاخەهای خشکیدەی درختان

**هەژکوپژاڵ** / hejk û p(i)jał/: ناو. شەخەڵ‌مەخەڵ؛ خشت‌وخاڵ؛ پووش‌وپاڵ ☚ آت و آشغال

**هەژک وپەژک** / hejik û pejik/: ☜ هەژك و بەژك

**هەژگ** / hejig/: ناو. ۱. بەلەک؛ پووز ۲. مەچەک؛ باسک ۳. ڕەشکەی کاکێشان ٤. لکە داری وشک ٥. ئالاش؛ هەلاش؛ کاشک؛ گەلا و چلوورەی سەر دارەڕا ٦. تێخولی سەوزە و میوە ☚ ۱. ساق ۲. ساعد ۳. تور کاهکشی ۴. شاخەی خشک درخت ۵. انبیره ۶. پوست میوە

**هەژگ و بژاڵ** / hejig û b(i)jal/: ☜ هەژك و بەژك

**هەژگ و پیژاڵ** / hejig û pîjał/: ☜ هەژك و بەژك

**هەژگەڵ** / hejgeł/: ناو. ۱. لکەداری وشکەوەبوو ۲. چڕوچیلکەی ئاوردوو ☚ ۱. شاخەی خشک شده ۲. چوب هیمه

**هەژگی** / hejgî/: ناو. پرزەی دار یان گیا ☚ پوشال چوب یا گیاه

**هەژماتن** / hejmatin/: ☜ هەژمارتن

**هەژمار** / hejmar/: ناو. هژمار: ۱. ژمارە؛ بژارە ۲. ئەژمار؛ ژمار ☚ ۱. شُمارە ۲. تیراژ

**هەژمارتن** / hejmartin/: چاوگ. هەژماردن؛ هژمارتن؛ هێژمارتن؛ هەژماتن؛ هێژمارتن؛ ژماردن؛ بژاردن ☚ شُمُردن

**هەژماردن** / hejmardin/: ☜ هەژمارتن

**هەژماردە** / hejmarde/: ئاوەڵناو. ۱. ☜ هەژماردی ۲. ☜ هەڵبژاردە

**هەژماردی** / hejmardî/: ئاوەڵناو. هەژماردە؛ ژمێراو ☚ شُمُردە

**هەژمارە** / hejmare/: ناو. ژمارە ☚ شمارە

**هەژمراندن** / hejm(i)randin/: چاوگ. ژماردن؛ بژاردن: ۱. ژمارە کردن ۲. حەساو کردن ☚ ۱. شُمُردن ۲. حساب کردن

**هەژمە** / hejme/: ناو. خزمەتکار؛ خزمەتچی ☚ خدمتکار

**هەژمەت** / hejmet/: ناو. مەینەت؛ خەم و خەفەت ☚ غم و اندوە

**هەژمێراو** / hejmêraw/: ☜ ژمێردراو

**هەژنۆ** / hejno/: ☜ ئەژنۆ

**هەژەت** / hejet/: ناو. ۱. ☜ حاجەت ۲. *[کنایە]* ئەندامی زاوزێی نێرینە ☚ ۱. ☜ حاجەت ۲. آلت

تناسلی نرینه

**هەژەک / hejek/**: ناو. شەکان؛ لەرزە ☲ اهتزاز

**هەژەند / hejend/**: ئاوەڵناو. سەرسووڕێن؛ سەیر و سەمەرە ☲ عجیب و غریب

**هەژەنەدەر / hejender/**: ئاوەڵناو. هەژێنەر؛ تەکان‌دەر ☲ تکان‌دهنده

**هەژهار / hejhar/**: ناو. هەژیار؛ زێدە ددان ☲ دندان اضافی

**هەژهان / hejhan/**: چاوگ. هەژیان؛ لەرزین؛ لەرزیان؛ لەریان ☲ لرزیدن

**هەژهەژاڵ / hejhejał/**: ناو. چیلکەوچاڵ؛ پرووپووش ☲ هیمه؛ شاخ و برگ خشک

**هەژهەژۆک / hejhejok/**: ئاوەڵناو. زۆر بە لەرزە ☲ بسیار لرزان

**هەژهەژۆکی / hejhejokî/**: ناو. لەرەی بێ پسانەوە ☲ لرزش مداوم

**هەژهەژیک / hejhejîk/**: ☜ **هەجهەجك**

**هەژی / hejî/**: ئاوەڵناو. ١. بەرەکەتی؛ شایستە؛ شایان؛ پەسند لە بەر دڵ و چاو ٢. بەنرخ؛ گرانبایی ☲ ١. شایسته؛ شایان ٢. ارزشمند

▣ **هەژی کرن**: حەز لێ‌کردن؛ ئەڤاندن؛ هەز ژێ کرن ☲ عاشق بودن

**هەژیا / hejya/**: ئاوەڵناو. باو؛ شیاو؛ ژێهاتی؛ هەژی ☲ شایان

**هەژیاتی / hejyatî/**: ناو. لێهاتوویی؛ ژێهاتوویی ☲ شایستگی

**هەژیار / hejyar/**: ☜ **هەژهار**

**هەژیان / hejyan/**: چاوگ. ١. هەژان؛ هەژهان ٢. هێژان؛ ژیان؛ هێنان ☲ ١. لرزیدن ٢. ارزیدن

**هەژیای / hejyay/**: ئاوەڵناو. ڕاژاو؛ شەکاوە ☲ دراهتزاز

**هەژیر / hejîr/**: ☜ **هەنجیر**

**هەژیرە / hejîre/**: ناو. هەنجیرەکێویلە ☲ انجیر کوهی

**هەژین / hejîn/**: چاوگ. ١. ڕاژان؛ هەژان ٢. بزووتن؛ جوولان ٣. هێژان؛ ژیان؛ هێنان ☲ ١. تکان خوردن ٢. جُنبیدن ٣. ارزیدن

• **هەژێن / hejên/**: پاشوشە. ڕاتڵەکێن؛ شەکێنەوە ‹دارهەژێن؛ دڵ‌هەژێن› ☲ ـ جُنبان

**هەژێنەر / hejêner/**: ☜ **هەژەندەر**

**هەس**[1] **/ hes/**: ناو. ١. حەس؛ هەست ‹هەس دەکەم سەرمامە› ٢. وزە؛ توانا ‹دەست و پام هەسیان نییە› ٣. حەسحەس؛ چەرخەچی ☲ ١. احساس ٢. نیرو ٣. نگهبان شب

**هەس**[2]: ئاوەڵناو. هەست؛ خەست؛ خەس؛ تونـد ‹تەڕە، هەسە، هەر ئەمەسە «مەسەل»› ☲ غلیظ

**هەس**[3]: دەنگەناو. هەرتە؛ هەرت؛ وتەی گا لە سەر هێڵ گەڕاندنەوە ☲ کلمەی برگرداندن گاو در شخم

▣ **هەس دان**: هەس دانەوە؛ گەڕاندنەوەی گا لە سەر هێڵ ☲ برگرداندن گاو شخم زنی از مرز شیار

**هەس دانەوە**: ١. ☜ **هەس دان** ٢. *[کینایە]* ڕوو شکاندن و تەمێ کردن ‹زۆری گوت و دەنگم نەکرد، ئاخری لە ناچاری هەسم دایەوە› ☲ ١. ☜ **هەس دان** ٢. جواب دندان‌شکن دادن

**هەسار / hesar/**: ناو. ١. ☜ **ئەستێر** ٢. ☜ **حەسار** ٣. قەلا؛ قەلات؛ دژ ☲ ١. ☜ **ئەستێر** ٢. ☜ **حەسار** ٣. قلعه

**هەسارگەلە / hesargele/**: ناو. پەچە؛ حەوشەمەڕ ☲ شبغازه

**هەسارە / hesare/**: ناو. ١. ☜ **ئەستێرە** ٢. پەچە؛ حەوشەمەڕ ☲ ١. ☜ **ئەستێرە** ٢. شبغازه

**هەسارەجووچکەدار / hesarecûçkedar/**: ناو. ئەستێرەی کلکەدار ☲ ستارەی دنبالەدار

**هەسارەزەڕینە / hesarezeřîne/**: ناو. کۆلکەزێڕینە؛ پەلکەڕەنگینە؛ کەسک و سۆر ☲ رنگین‌کمان

**هەسارەشناس / hesareş(i)nas/:** ☜ **ئەستێرەناس**

**هەسارەگەڕێن / hesaregeřên/:** ☜ **ئەستێرەناس**

**هەسارەناس / hesarenas/:** ☜ **ئەستێرەناس**

**هەساری[1] / hesarî/:** ☜ **ئەستێر**

**هەساری[2]:** ئاوەڵناو. قەڵانشین ☰ قلعەنشین

**هەساس / hesas/:** ☜ **حەسحەس**

**هەسان[1] / hesan/:** چاوگ. حەسانەوە ☰ آسودن

**هەسان[2]:** ناو. هاسان؛ هسان؛ سان؛ بەردەسان ☰ فسان

◻ **هەسان دان:** هەسان کرن؛ ساوین بە هەساندا بۆ تیژ کردن ☰ تیز کردن تیغ با فسان

**هەسان کرن:** ☜ **هەسان دان**

**هەسان[3]:** ☜ **ئاسان**

**هەساندن / hesandin/:** چاوگ. هەست کردن ☰ حس کردن

**هەساندی / hesandî/:** ئاوەڵناو. تیژکراو بە هەسان ☰ تیزشده با فسان

**هەسانە / hesane/:** ناو. دۆسۆڵ؛ دۆسوێر ☰ دوغ چکیده

**هەسانەڤە / hesaneve/:** ☜ **حەسانەوە**

**هەسانەوە / hesanewe/:** ☜ **حەسانەوە**

**هەساو[1] / hesaw/:** ☜ **حیساب**

**هەساو[2]:** ئاوەڵناو. ١. تیژکراو بە سان ٢. ساو؛ بێ‌هەور (ئاسمان) ☰ ١. تیزشده با فسان ٢. صاف (آسمان)

**هەساوین / hesawîn/:** چاوگ. ساوین؛ پێدا مالین ☰ مالیدن؛ سایدن

**هەسباندن / hesbandin/:** چاوگ. گومان بردن؛ وا تێگەیشتن ‹ئەو من زارۆ دهەسبێنە› ☰ ارزیابی کردن

**هەسپ / hesp/:** ناو. ئەسپ ☰ اسب

◻ **هەسپێ ئێختە:** هەسپێ حەشا؛ هەسپێ گوتۆ؛ ئەسپی ئێختەکراو؛ ئەسپی گون دەرهاتی ☰ اسب اخته شده

**هەسپێ بەزا:** ئەسپی گرێوە غار ☰ اسب مسابقه

**هەسپێ حەشا:** ☜ **هەسپێ ئێختە**

**هەسپێ دارین:** پایسکل؛ دووچەرخە ☰ دوچرخه

**هەسپێ فەحل:** ئەسپی تۆوی بۆ پەڕینە سەر ماین ☰ اسب گُشن

**هەسپێ قولە:** ئەسپی شێ ☰ نژادی از اسب

**هەسپێ کەحیل:** ئەسپی ڕەسەن ☰ اسب اصیل

**هەسپێ گونۆ:** ☜ **هەسپێ ئێختە**

**هەسپێ مێ:** ماین ☰ مادیان

**هەسپێ نەبی:** تاژیلە؛ تاژیلۆکە؛ کوللەحاجی؛ حوشترخوا؛ تاژی ئەحمەدڕاوکەرە؛ بالووک؛ ئەسپی حەسەن حوسێنان ☰ آخوندک

**هەسپێ نێر:** ئەسپ ☰ اسب

**هەسپا / hespa/:** ئاوەڵناو. ئەسپا؛ لەسەرخۆ ☰ آهسته

**هەسپاو / hespaw/:** ☜ **ئەسپاب**

**هەسپایی / hespayî/:** ناو. ئەسپایی؛ ئارامی؛ لەسەرخۆیی ☰ آهستگی

**هەسپزە / hesp(i)ze/:** ناو. گیایەکە لە وێنجە دەکا ☰ اسفرزه

**هەسپست / hespist/:** ☜ **هەسپک**

**هەسپک / hespik/:** ناو. هەسپست؛ وێنجەکێویلە ☰ یونجەی خودرو

**هەسپێ / hespê/:** ناو. هسپێ؛ هسپی؛ هەپش؛ هەشپش؛ هەشپشی؛ هەشپشێ؛ ئەسپێ؛ ئەسپی؛ سپێ ☰ شپش

**هەست[1] / hest/:** ناو. ١. دارایی؛ بوو ٢. شەس؛ هشەک؛ حس ‹بە دڵی سادە و بە هەستی پاکی/ بە شەرم و حەیا و ئاکاری چاکی «هێمن»› ٣. ☜ **ئێسک** ٤. ☜ **هەشت** ☰ ١. دارایی؛ موجودی ٢. احساس ٣. ☜ **ئێسک** ۴. ☜ **هەشت**

◻ **هەست پێ کردن:** ☜ **هەست کردن**

**هەست کردن:** هەست پێ کردن؛ پێزانین؛ هەسین؛ حەس کردن ☰ احساس کردن

**هەست وە بەر خۆ هێنانەوە:** هاتنەوە سەر خۆ؛ وە خۆدا هاتن؛ وە دەس هێنانەوەی هۆشیاری و هێوری خۆ ☰ به خود آمدن

**هەست**[2]: ☜ **هەس**[2]

**هەستار** / hestar/: ☜ **هەرسی**

**هەستارە** / hestare/: ☜ **ئەستێرە**

**هەستان** / hestan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //هەستای؛ هەڵدەستی؛ هەستە// ١. ڕا بوون؛ هاتنە سەر پا ‹ئەی سەبا! ئەی قاسیدی ئەربابی نامووس و شەرەف/ هەستە تا کەرکووک بچۆ ئازانە! ئەمما لاتەخەف! «بێخود»› ٢. بێدار بوونەوە لە خەو ٣. زەق و ڕەپ بوون ☰ ١. برخاستن ٢. بيدار شدن از خواب ٣. راست شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: هەستاو/ چاوگی نەرێنی: نەهەستان

**هەستاندن** / hestandin/: چاوگ. ١. ڕاکردن؛ بلند کردن بە قیتەوە ٢. لە خەو ڕاپەڕاندن ٣. ڕەپ و ڕاست ڕاگرتن ٤. ئەستاندن؛ ساندن ☰ ١. بلند کردن ٢. بيدار کردن ٣. راست و مستقيم نگهداشتن ۴. گرفتن

**هەستاندنەوە** / hestand(i)newe/: چاوگ. هەستاننەوە؛ ئەستاندنەوە: ١. دوای کەوتن بلند کردنەوە ٢. سەندنەوە؛ ساندنەوە ☰ ١. پس از افتادن دوباره بلند کردن ٢. باز پس گرفتن

**هەستاننەوە** / hestan(i)newe/: ☜ **هەستاندنەوە**

**هەستانەوە** / hestanewe/: چاوگ. ١. دوای کەوتن ڕابوون ٢. لە نەخۆشی ڕزگار بوون ٣. زیندوو بوونەوە دوای مردن ٤. وەخەبەر هاتن بۆ پارشێو ☰ ١. بعد از افتادن بلند شدن ٢. شفا يافتن ٣. دوباره زنده شدن ۴. بيدار شدن براى سحرى

**هەستاو** / hestaw/: ئاوەڵناو. بەرپا؛ باز؛ دامەزراو ☰ برپا

**هەستای** / hestay/: ☜ **هەشتا**

**هەستبزوێن** / hestbizwên/: ئاوەڵناو. دڵبزوێن ☰ دل‌انگيز

**هەستر** / hestir/: ☜ **هێسر**

**هەستک** / hestik/: ناو. هەستیک؛ هێچک؛ هەچی؛ ئالقەی گوریسی بارەوباران ☰ حلقه‌ى رسن باربند

**هەستکار** / hestkar/: ☜ **هەستۆک**

**هەستکەر** / hestker/: ☜ **هەستۆک ـ١**

**هەستوخوست** / hest û xust/: ناو. ئاگا و تەکان؛ هشەک و جووڵە ☰ حس و حرکت

**هەستون** / hestun/: ☜ **ستون**

**هەستونست** / hest û nist/: ☜ **هەستونیست**

**هەستونەست** / hest û nest/: ناو. هەموو هەست و پێ زانین ☰ احساسات درونى

**هەستونیست** / hest û nîst/: ناو. هەستونست؛ هەس‌ونس؛ هەس‌ونیس؛ بوون و نەبوون ☰ هست‌ونيست

**هەستۆ** / hesto/: ☜ **ئەستۆ**

**هەستۆک** / hestok/: ئاوەڵناو. هەستکار؛ هەستیار: ١. هەستەوەر؛ هەستکەر؛ خاوەن کاردانەوە لە هەمبەر هۆکاری دەرەکی ٢. پڕ لە هەست؛ ناسک‌هەست ☰ ١. حسّاس ٢. پُراحساس

**هەستۆکی** / hestokî/: ناو. هەستیاری: ١. هەستەوەری؛ دۆخی هەبوونی کاردانەوە لە بەرامبەر هۆکاری دەرەکییەوە ‹ئەم ئامرازە هەستۆکییەکی باشی هەیە› ٢. حەساسییەت؛ ئالێرژی؛ جۆرێ ناکۆکی لەش ‹هەستۆکی بە باقلە› ☰ ١و٢. حساسيت

**هەستو** / hestû/: ناو. ١. ☜ **ئێسک** ٢. ناوکەمیوە؛ دەنکی ڕەقی میوە ☰ ١. ☜ **ئێسک** ٢. هسته

**هەستە**[1] / heste/: ناو. ١. ئەستێ بۆ پووشوو ٢. ☜ **ئێسک** ☰ ١. آهن آتشزنه ٢. ☜ **ئێسک**

**هەستە**[٢]: ئاوەڵناو. ئەسپایی؛ لە سەر خۆ ☰ آهسته

**هەستەر** / hester/: ☜ **هێسر**

**هەستەرە** / hestere/: ناو. موس؛ گوێزان؛ گیزان؛ تیخی مووتاش ☰ استره

**هەستەم** / hestem/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **ئەستەم**[١] ٢. ئەسپایی؛ سپایی؛ ئاستەم ☰ ١. ☜ **ئەستەم**[١] ٢. آهسته

**هەستەوەر** / hestewer/: ☜ **هەستۆك ـ١**

**هەستەوەری** / hestewerî/: ☜ **هەستۆکی ـ١**

**هەستەی** / hestey/: ئاوەڵناو. توند و شلی تێکەڵاو؛ تیر تێکەڵ بە تراو ☰ غلیظ و رقیق مخلوط

**هەستی** / hestî/: ناو. ١. ☜ **ئێسك** ٢. بوون؛ هەبوون ☰ ١. ☜ **ئێسك** ٢. هستی؛ وجود

▣ **هەستی گرتن**: شکستەبەندی کردن ☰ شکستەبندی کردن

**هەستیار** / hestyar/: ئاوەڵناو. ١. ☜ **هەستۆك** ٢. گرنگ و جێگەی سەرنج ‹بارودۆخی هەستیار› ☰ ١. ☜ **هەستۆك** ٢. حسّاس

**هەستیارانە** / hestyarane/: ئاوەڵناو. ١. هەستۆکی؛ پێوەندیدار بە هەستەوە ٢. شاعیرانە ☰ ١. احساسی ٢. شاعرانه

**هەستیاری** / hestyarî/: ناو. ١. ☜ **هەستۆکی** ٢. هەستناسکی ☰ ١. ☜ **هەستۆکی** ٢. لطافت احساس

**هەستیسڤك** / hestîsiv(i)k/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* خوێنشیرین؛ ڕەزاسووك؛ ئێسكسووك ☰ دوستداشتنی

**هەستیف** / hestîf/: ☜ **هەستیڤ**

**هەستیڤ** / hestîv/: ناو. هەستیف؛ مەسێ: ١. ئەستێولك؛ ئاسنێ کە بە سەر تەنوورا ڕایدەنگێون ٢. ئاسنێ کە نانی پێ لە تەندوور دەکەنەوە ☰ ١. آهنی که بر بالای تنور می‌گذارند ٢. آهنی که با آن نان را از تنور می‌کشند

**هەستیك** / hestîk/: ☜ **هەستك**

**هەستیکۆژ**[١] / hestîkoj/: ناو. کرۆژە؛ کرکرۆکە ☰ غضروف

**هەستیکۆژ**[٢]: ئاوەڵناو. *[مەجاز، پلار]* دەوریلێس؛ زۆرخۆر ☰ پُرخور

**هەستیکۆلی** / hestîkolî/: ئاوەڵناو. ئێسكشکاو؛ ئێسكڕزاو ☰ پوسیده استخوان

**هەستیگران** / hestîg(i)ran/: ئاوەڵناو. خوێنتاڵ؛ ڕەزاقورس؛ ئێسكگران؛ ڕەزاگران ☰ گوشت‌تلخ

**هەستیگرەك** / hestîg(i)rek/: ناو. هۆستای شکستەبەند ☰ شکسته‌بند

**هەستیگەشتك** / hestîgeştik/: ئاوەڵناو. پەلقەوی؛ پێشە ئەستوور ☰ درشت‌استخوان

**هەستێ** / hestê/: ناو. ئەستێ؛ بەردەستێ؛ هەستە ☰ آهن آتشزنه

**هەستێرە** / hestêre/: ☜ **ئەستێرە**

**هەستێس** / hestês/: ☜ **هەژدە**

**▪ هەستێن** / -hestên/: پاشەوشە. ١. ئەستێن؛ وەگر ‹باجهەستێن› ٢. لە خەو بێدار کەر ‹خەڵكهەستێن› ٣. بڵندکەر ‹بەردهەستێن› ☰ ١. گیرنده ٢. بیدار کننده ٣. بلندکننده

**▪ هەستێنەوە** / -hestênewe/: پاشەوشە. ئەستێنەوە ‹تۆڵە هەستێنەوە؛ تالان هەستێنەوە› ☰ بازگیرنده

**هەستێوك** / hestêwik/: ناو. وردەئێسك ☰ ریزه استخوان

**هەسر** / hesir/: ☜ **هەرسی**

▣ **هەسر ئانتش**: ئاخ هەڵکێشان ☰ آه کشیدن

**هەسر بیاییش**: دەرکردن؛ لە خۆ دوور خستنەوە ☰ راندن

**هەسروێ** / hesirwê/: ☜ **خەزوور**

**هەسك**[١] / hesk/: ناو. ١. شەن؛ شەنە ٢. ☜ **ئەسکوێ** ☰ ١. افشون ٢. ☜ **ئەسکوێ**

**هەسك**[٢]: ئاوەڵناو. پشافتە؛ هەڵپشاوتە؛ لۆچوپۆچ ☰

مُچالەشدە

**هەسکاندن / heskandin/**: چاوگ. پشافتن؛ هەڵپشاوتن ⊟ مُچالە کردن

**هەسکوێ / hesk(i)wê/**: ☜ نەسکوێ

**هەسکۆ / hesko/**: ☜ نەسکوێ

**هەسکە / heske/**: ناو. ١. هەنیسک؛ ئانیسک؛ دەنگێ لە قورگ لە خۆشیان یان پاش گریان ٢. ☜ نەسکوێ ⊟ ١. خَنجە ٢. ☜ نەسکوێ

**هەسکەهەسک / heskehesk/**: دەنگەناو. ١. هەسکەی زۆر ٢. هەناسەی توند و لە پەستا ⊟ ١. خَنجەی متوالی ٢. هِن‌هِن

**هەسکیان / hesk(i)yan/**: چاوگ. ئانیسک دان؛ بەرەنیسکێ دان ⊟ خَنجیدن

**هەسکێ / heskê/**: ناو. کەمچە؛ ماڵە ⊟ کمچەی بنایی

**هەسن / hesin/**: ☜ ئاسن

**هەسنجاو / hesincaw/**: ناو. ئاسنجاو: ١. ئامرازی ماڵ لە ئاسن و مس و کانزای‌تر ٢. لەکارتە؛ داشتەشکاو؛ کۆن و لەکارکەوتە (کەرەستە و ئامراز) ⊟ ١. ابزار فلزی ٢. قُراضە

**هەسندڕک / hesindiřik/**: ☜ ئاسندڕك

**هەسنفڕێن / hesinf(i)řên/**: ناو. ئاسن‌کێش ⊟ آهنربُا

**هەسنکەر / hesinker/**: ☜ ئاسنگەر

**هەسنگ / hesing/**: ☜ ئاسن

**هەسنگەر / hesinger/**: ☜ ئاسنگەر

**هەسنی / hesnî/**: ئاوەڵناو. ئاسنین؛ چێ‌بوو لە ئاسن ⊟ آهنی

**هەسوان / heswan/**: ☜ هەسوون[1]

**هەس‌ونس / hes û nis/**: ☜ هەست‌ونیست

**هەس‌ونیس / hes û nîs/**: ☜ هەست‌ونیست

**هەس‌وهۆڵ / hes û hoł/**: ئاوەڵناو. خەست‌وخۆڵ ⊟ غلیظ

**هەسو / hesû/**: ناو. ١. ئاسۆ؛ ئاسۆگ؛ ئاسوو؛ کەنارەی عاسمان ٢. لۆکەی ناوئاخنی جلک ⊟ ١. اُفُق ٢. لایی

**هەسود / hesûd/**: ناو. حەسوود؛ بەرچاوتەنگ ⊟ حسود

**هەسورە / hesûre/**: ☜ خەزوور

**هەسوک / hesûk/**: ناو. گیایەکی کێوییە ⊟ گیاهی است

**هەسون[1] / hesûn/**: چاوگ. تێپەڕ. //هەسووت؛ دەهەسووی؛ بهەسوو// هۆسین؛ هەسوان؛ هێسین؛ ساوین؛ پێداماڵین ⊟ مالیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ــ/ چاوگی نەرێنی: نەهەسوون

**هەسون[2]**: ناو. ئەستوون؛ کۆڵەکە؛ ئەستوندەک ⊟ ستون

**هەسونەزێڕینە / hesûnezêřîne/**: ناو. پەلکەزێڕینە ⊟ رنگین‌کمان

**هەسویی / hesûyî/**: ئاوەڵناو. ئاسۆیی؛ کێڕی؛ ڕاست و لە درێژەوە ⊟ افقی

**هەسە / hese/**: ئاوەڵناو. خەستە؛ هەسەوبووگ ⊟ غلیظ شده؛ چکیده

▣ **هەسەی دوانە**: دۆی ئاو لێ چنراوی خەستەوەکراو بۆ کەشک ⊟ مایەی کشک

**هەسەر / heser/**: ناو. ١. ☜ هێسر ٢. بیر و خەیاڵات ⊟ ١. ☜ هێسر ٢. فکر و خیال

**هەسەرە / hesere/**: ☜ هێسر

**هەسەلە / hesele/**: ناو. تیترواسک؛ مەلێکی بچووکە ⊟ پرندەای کوچک

**هەسەڵ / heseł/**: ☜ هەنگوین

**هەسەم / hesem/**: ☜ هەرەس ــ١

**هەسەمنای / hesemnay/**: چاوگ. پەستاوتن؛ پتەو کردنەوە ⊟ فشُردن و سفت کردن

**هەسەمیای / hesemyay/**: چاوگ. پەستێوران؛ پتەو بوونەوە ⊟ فشُردە و سفت شدن

**هەسەن‌بەگی / hesenbegî/**: ناو. گیائادەمە ☰ مهر گیاه

**هەسەنی / hesenî/**: ناو. جۆرێ هەنگوور ☰ نوعی انگور

**هەسەوبوگ / hesewbûg/**: ناوەلناو. هەسە؛ خەستە ‹ماس هەسەوبووگ› ☰ غلیظ شده؛ آب چکیده

**هەسهەس / heshes/**: ☜ **حەسحەس**

**هەسهەسوک / heshesûk/**: ناو. /کینایە/ شاخی بزنەکێوی و کەلەکێوی ☰ شاخ بُز و میش کوهی

**هەسی / hesî/**: ناو. ۱. بوون؛ هەبوون ۲. خەستی ☰ ۱. هستی ۲. غلظت

**هەسیان / hesyan/**: چاوگ. ۱. ئاگا کردن؛ حەسیان ۲. حەسانەوە؛ سانەوە ☰ ۱. احساس کردن ۲. آسودن

**هەسیانەڤە / hesyaneve/**: ☜ **حەسانەوە**

**هەسیدە / hesîde/**: ناو. هەلوای لە ئارد و دۆشاو ☰ حلوای آرد و شیره

**هەسیر / hesîr/**: ناو. ۱. حەسیر؛ هەسیل؛ ڕایەخی لە جەگەن و قامیش ۲. یەخسیر؛ دیل ☰ ۱. حصیر؛ بوریا ۲. اسیر

**هەسیرۆ / hesîro/**: ☜ **خەزوور**

**هەسیرە / hesîre/**: ☜ **ئەستێرە**

**هەسیل / hesîl/**: ☜ **هەسیر-۱**

**هەسین / hesîn/**: چاوگ. هەست کردن ☰ حس کردن

**هەسیو / hesîw/**: ناوەلناو. ئاوس؛ زگپڕ ☰ باردار

**هەسێب / hesêb/**: ☜ **حیساب**

**هەسێبگەر / hesêbger/**: ناو. ژماریار؛ ژمێریار ☰ آمارگیر

**هەسێر / hesêr/**: ☜ **هەسێڵ**

**هەسێرە / hesêre/**: ☜ **ئەستێرە**

**هەسێرەزێڕینە / hesêrezêřîne/**: ناو. پەلکەزێڕینە؛ کۆلکەزێڕینە؛ کەسکەسۆر ☰ رنگین‌کمان

**هەسێڵ / hesêł/**: ناو. هەسێر؛ ئەستێر ☰ استخر

**هەسێنە**[1] **/ hesêne/**: ناو. خەستێنە؛ دۆی خەستەوە بووی بنی دەوانە ☰ دوغ چکیده

**هەسێنە**[2]: ناوەلناو. خەستە؛ خەستەوەبوو ☰ غلیظ شده

**هەش**[1] **/ heş/**: ناو. ۱. خم؛ خوم؛ گیایەکە بۆ ڕەنگی شین دەکار دەکرێ ۲. حەش؛ ورچ؛ هەرس؛ هرس؛ حورچ ۳. هێش؛ هۆش ☰ ۱. نیل ۲. خرس ۳. هوش

⊡ **سەر لە هەش نان**: /کینایە/ تازیە گرتن؛ ئازیەتباری کردن ‹ئەتۆ هەناوت بۆ کورد بووە ڕەش/ منیش بۆ کوردی سەرم نا لە هەش «هێمن»› ☰ عزا گرفتن

**هەش**[2]: دەنگەناو. وتەی دنەدانی سەگ ☰ کلمەی برانگیختن سگ

**هەش**[3]: ☜ **هش**[3]

**هەشا / heşa/**: ☜ **حاشا**

**هەشار / heşar/**: ناوەلناو. ۱. ☜ **حەشار** ۲. ☜ **هوشیار** ۳. درێژ ‹هەشار کیشاسە› ☰ ۱. ☜ **حەشار** ۲. ☜ **هوشیار** ۳. دراز

⊡ **هەشار دان**: شاردنەوە؛ وەشارتن ‹نازانم لە ترسی چی خۆی حەشار داوە؟!› ☰ پنهان کردن

**هەشار کیشایش**: ڕاکشان؛ هەلاژیان ☰ دراز کشیدن

**هەشارگە / heşarge/**: ☜ **حەشارگە**

**هەشاشین / heşaşîn/**: ناو. بەلا و چۆرتم ☰ بلا و مُصیبت

**هەشافتن / heşaftin/**: چاوگ. ۱. قڕ کردن؛ لە ناو بردن ۲. بن قوڕدان ☰ ۱. نابود کردن ۲. زیر گِل بُردن

**هەشامات / heşamat/**: ☜ **حەشامات**

**هەشان / heşan/**: چاوگ. ئاخنین؛ بە زۆر خستنە

ناو ☚ آکندن

**هەشاندن** / heşandin/: چاوگ. ١. تێئاخنین ٢. پڕ کردنەوە ☚ ١. چپاندن ٢. باز پُر کردن

**هەشبەسەر** / heşbeser/: ئاوەڵناو. [کینایە] ١. ڕۆژڕەش؛ چارەڕەش؛ بەدبەخت ‹کە من کەر بم، بارەبەر بم/ کورتان لە پشت، هەشبەسەر بم/ فەرقی چییە؟/ دەرد هەر دەردە/ کەری تۆ بم یا هی جەردە؟! «پەشێو»› ٢. تازیەبار؛ ئازیەتبار ☚ ١. سیەروز ٢. عزادار

**هەشپا** / heşpa/: ناو. هەشتپا؛ هەشتپێ؛ جلە؛ ئوختاپووس ☚ هشتپا

**هەشپاڵو** / heşpału/: ناو. بیچمێکی هەندسی بە هەشت پاڵووی یەکگرتووەوە ☚ هشتوجهی

**هەشپش** / heşpiş/: ☜ هەسپێ

**هەشپشی** / heşp(i)şî/: ☜ هەسپێ

**هەشپشێ** / heşp(i)şê/: ☜ هەسپێ

**هەشت**[1] / heşt/: ناو. هەست؛ هەیشت؛ حەشت؛ ژمارەی سەرەکی، دوای حەوت و پێش نۆ ☚ هشت

**هەشت**[2]: ئاوەڵناو. هەست؛ هەیشت؛ حەشت: ١. یەکێک زۆرتر لە حەوت ‹هەشت کتێب› ٢. هەشتەم ‹ڕیزی هەشت› ☚ ١و٢. هشت

**هەشتا**[1] / heşta/: ناو. هەستای؛ هەشتای؛ هەشتی؛ هەشتێ؛ هەشدە؛ هەیشتای؛ هەشتاد؛ هەیشتا؛ هشتا؛ حەشتێ؛ ژمارەی سەرەکی پاش حەفتا و نۆ و پێش هەشتاویەک ☚ هشتاد

**هەشتا**[2]: ناو. هەستای؛ هەشتای؛ هەشتی؛ هەشتێ؛ هەشدە؛ هەیشتای؛ هەشتاد؛ هەیشتا؛ هشتا؛ حەشتێ: ١. یەکێک زۆرتر لە حەفتا و نۆ ٢. هەشتاهەم؛ هەشتایەم ☚ ١و٢. هشتاد

**هەشتادم** / heştadem/: ☜ هەشتایەم

**هەشتادمی** / heştademî/: ☜ هەشتایەمی

**هەشتادمین** / heştademîn/: ☜ هەشتایەمین

**هەشتاڵو** / heştału/: ناو. هوڵوو؛ هڵوو؛ هەڵوو؛ قۆخ؛ کۆخ؛ خۆخ؛ قۆخی: ١. دارێک بە گەڵای باریک و درێژەوە کە لێوارەکەی دانووشتاوە و گوڵی گەورەی پەمەیی مەیلەو ئەرخەوانی دەر دەکا ٢. میوەی گۆشتن، درشت، شیرین و ئاوداری ئەو دارە کە پێستیکی ناسک و کوڵکنی زەرد و سوور و پێشەی درشتی چێوی هەیە ☚ ١و٢. هلو

**هەشتاڵوکوت** / heştałûkut/: ناو. لەتکە خۆخ ☚ برگەی هلو

**هەشتامین** / heştamîn/: ☜ هەشتایەمین

**هەشتاو** / heştaw/: ناو. لەز؛ پەلە ☚ شتاب

**هەشتاوی** / heştawî/: ئاوەڵناو. بەلەز؛ بە پەلە ☚ شتابزدە

**هەشتاهەم** / heştahem/: ☜ هەشتایەم

**هەشتاهەمی** / heştahemî/: ☜ هەشتایەمی

**هەشتاهەمین** / heştahemîn/: ☜ هەشتایەمین

**هەشتای** / heştay/: ☜ هەشتا

**هەشتاین** / heştayin/: ☜ هەشتایەم

**هەشتایەم** / heştayem/: ئاوەڵناو. هەشتادەم؛ هەشتاین؛ هەشتاهەم؛ بە ڕیز، پلە و جێگەی هەشتاوە ☚ هشتادم

**هەشتایەمی** / heştayemî/: جێناو. هەشتاهەمی؛ هەشتادەمی؛ ئەوەی لە پلە و ڕیز و پێگەی هەشتادەمدایە ☚ هشتادمی

**هەشتایەمین** / heştayemîn/: ئاوەڵناو. هەشتامین؛ هەیشتاین؛ هەشتاهەمین؛ هەشتاین؛ هەشتادەمین؛ بە ڕیز، پلە و پایەی هەشتادەمەوە ☚ هشتادمین

**هەشتپا** / heştpa/: ☜ هەشپا

**هەشتپەڕ** / heştpeř/: ناو. هەشتدان؛ گەولە جۆ؛ جۆیێ کە شەش ڕیز دەگرێ و بە دێم نابێ ☚ نوعی جو آبی مرغوب

**هەشتپێ** / heştpê/: ☜ **هەشپا**

**هەشتتیر** / heşttîr/: ناو. هەشتیر؛ جۆرێ دەمانچە کە هەشت فیشەک دەخوا ☲ نوعی تپانچە

**هەشتدان** / heştdan/: ☜ **هەشتپەڕ**

**هەشتر** / heştir/: ☜ **وشتر**

**هەشترمە** / heştirme/: ناو. وشترمر؛ وشترمریشک ☲ شترمُرغ

**هەشتسەد**[1] / heştsed/: ناو. هەشسەد؛ هەشسەت؛ ژمارەی سەرەکی پاش حەوسەد و نەوەد و نۆ، پێش هەشتسەد و یەک ☲ هشتصد

**هەشتسەد**[2]: ئاوەڵناو. هەشسەد؛ هەشسەت: ١. یەکێک زۆرتر لە حەوسەد و نەوەد و نۆ ٢. هەشسەدەم ☲ ١و٢. هشتصد

**هەشتسەدەمین** / heştsedemîn/: ئاوەڵناو. هەشسەدەمین؛ لە ڕیز، پلە و جێگای هەشسەدەمدا ☲ هشتصدمین

**هەشتقۆزی** / heştqozî/: ☜ **هەشتگۆشە**

**هەشتگۆشە** / heştgoşe/: ناو. هەشتقۆزی؛ هەشتپالوو ☲ هشت‌گوش

**هەشتگوڵ** / heştguł/: ئاوەڵناو. تەواو گوڵ داو (گەنم) ‹گەنمەکە جێی وایە هەشتگوڵ بووە› ☲ تمام خوشه شده (گندم)

**هەشتلا** / heştla/: ئاوەڵناو. هەشت توێ ☲ هشت لایە

**هەشتم** / heştim/: ☜ **هەشتەم**

**هەشتن** / heştin/: ☜ **هەشتەم**

**هەشتنە** / heşt(i)ne/: ☜ **هەشتەم**

**هەشتە** / heşte/: ناو. هەشت ڕۆژ دوای ڕووداوێ یان بۆ وەخت دانان ‹حەوت ڕۆژ لە مالم هەشتە لە سەفەر «مەسەل»› ☲ هشتمین روز

**هەشتەرخان** / heşterxan/: ناو. وشترخان؛ ئۆدەی زۆر گەورە و دیواربلند ☲ سالن

**هەشتەک** / heştek/: ☜ **هەشتیەك**

**هەشتەم** / heştem/: ئاوەڵناو. هەشتم؛ هەشتن؛ هەشتنە؛ هەیشتن؛ بە ڕیز، پلە و جێگای هەشتەوە ☲ هشتم

**هەشتەمی** / heştemî/: جێناو. هەشتەم؛ ئەوەی لە ڕیز، پلە و جێگای هەشتەمدایە ☲ هشتمی

**هەشتەمین** / heştemîn/: ئاوەڵناو. هەشتەمی؛ لە ڕیز، پلە و جێگای هەشتەمدا ☲ هشتمین

**هەشتی**[1] / heştî/: ناو. ١. هەشتگۆشە؛ هەشتسووچ ٢. ☜ **هەشتا** ☲ ١. هشت‌گوشە ٢. ☜ **هەشتا**

**هەشتی**[2]: ئاوەڵناو. زل و گوشاد (بۆ ژووری گوشاد و سەماوەری گەورەی دەڵێن) ☲ بزرگ

**هەشتیر** / heştîr/: ☜ **هەشتتیر**

**هەشتینەک** / heştînek/: ئاوەڵناو. پێکهاتوو لە هەشت پارەی وەک یەک ☲ هشتپارە

**هەشتیەک** / heşt yek/: ناو. هەشتەک؛ هەشتێک؛ لە هەشت پاژ پاژێک ☲ یک‌هشتُم

**هەشتێ** / heştê/: ☜ **هەشتا**

**هەشتێس** / heştês/: ☜ **هەژدە**

**هەشتێسن** / heştêsin/: ☜ **هەژدەهەم**

**هەشتێسنە** / heştêsne/: ☜ **هەژدەهەم**

**هەشتێک** / heştêk/: ☜ **هەشتیەك**

**هەشدە** / heşde/: ☜ **هەشتا**

**هەشر** / heşr/: ☜ **حەشر**

**هەشسەت** / heşset/: ☜ **هەشتسەد**

**هەشسەد** / heşsed/: ☜ **هەشتسەد**

**هەشسەدەم** / heşsedem/: ئاوەڵناو. بە ڕیز پلە و پایەی هەشتسەدەوە ☲ هشتصدُم

**هەشسەدەمی** / heşsedemî/: جێناو. ئەوەی لە پلەی هەشسەدەمدایە ☲ هشتصدُمی

**هەشسەدەمین** / heşsedemîn/: ☜ **هەشتسەدەمین**

**هەشف** / heşf/: ناو. ١. کار و ڕەوتی سڕین؛ ماڵینەوە ٢. کاری کوژاندنەوەی نووسراو؛

سڕینەوە ٣. چۆنیەتی نەمان و لە ناو چوون؛ فەوتان 🇮🇷 ١. زدودگی ٢. عمل پاک کردن نوشته ٣. نابودی

**هەشفاندن** / heşfandin/: چاوگ. هەشفاندن؛ هەشفین: ١. سڕینەوەی خەت یان چڵک و ژەنگ ٢. قڕان تێخستن؛ لە ناو بردن ٣. ئاخنین؛ تێئاخنین 🇮🇷 ١. زدودن ٢. نابود کردن ٣. آکندن

**هەشفی** / heşfî/: ئاوەڵناو. سڕاو؛ پاکەوەکراو 🇮🇷 زدوده

**هەشفین** / heşfîn/: ☜ هەشڤاندن

ـ **هەشفێن** / -heşfên/: پاشوشە. ١. لەنێوبەر ٢. کوژێنەر ٣. ـ ماڵ 🇮🇷 ١. نابودگر ٢. ـ زُدا ٣. ـ مال

**هەشڤین** / heşvîn/: چاوگ. سڕین؛ ئەسترین؛ پاک کردنەوە 🇮🇷 زدودن

**هەشک** / heşk/: ناو. ١. چیلکە و چاڵ؛ هەژگەڵ ٢. چەرمی قاچ و دەست لە پێستەدا 🇮🇷 ١. خس و خاشاک ٢. چرم دست و پای خیک

**هەشلێدراو** / heşlêd(i)raw/: ئاوەڵناو. چویتلی؛ دە خەمنراو 🇮🇷 نیلگون

**هەشمەت** / heşmet/: ناو. گۆری؛ نۆکەر؛ خولام 🇮🇷 نوکر

**هەشمەتکار** / heşmetkar/: ناو. خزمەتکار ‹هەشمەتکارێ بەژنێ تەمە› 🇮🇷 خدمتکار

**هەشە** / heşe/: ناو. ورچ؛ هرچ 🇮🇷 خرس

**هەشەری** / heşerî/: ☜ حەشەری

**هەشەکە** / heşeke/: ناو. ١. هەڕەشە؛ گەف؛ گوڕەشە ٢. لەرە؛ لەرزە. هەروەها: **خستنە/ کەوتنە** هەشەکە 🇮🇷 ١. تهدید ٢. لرزش

**هەشەنگ** / heşeng/: ☜ هەرەنگ

**هەشی** / heşî/: ناو. شین؛ کەوە 🇮🇷 کبود

**هەشیر** / heşîr/: ناو. حەسیر لە جەگەن یان لە چیتک 🇮🇷 حصیر؛ بوریا

**هەشیمی** / heşîmî/: ناو. دوینە؛ ترخێنە ‹هەشیمی! گەلاپانی قەدیمی! خۆت لێ هاویشتوومە سەر تەختی سیمی! «فۆلکلۆر»› 🇮🇷 ترخینه

**هەشین** / heşîn/: ناو. ١. هەشی؛ کەوە ٢. شین؛ سەوز؛ کەسک 🇮🇷 ١. کبود ٢. سبز

▣ **هەشین بوون**: ڕوان؛ شین بوونی ڕووەک 🇮🇷 رُستن نباتات

**هەشیناتی** / heşînatî/: ناو. سەوزەوات 🇮🇷 سبزیجات

**هەشینایی** / heşînayî/: ناو. کەوەیی؛ کەوگی؛ شینی؛ ڕەنگی ئاوی تۆخ 🇮🇷 کبودرنگی

**هەشینۆک** / heşînok/: ناو. ١. جۆرێ ماسی ٢. تای توند؛ یاو سەخت 🇮🇷 ١. نوعی ماهی ٢. تب شدید

**هەف**[١] / hef/: ناو. خەو؛ خاو 🇮🇷 خواب

**هەف**[٢]: دەنگ. عەف؛ حەپ؛ حەپە؛ گەفە 🇮🇷 واق سگ

**هەف ـ**[٢]: ☜ هەف ـ[٢]

**هەفار** / hefar/: ناو. ١. بۆخ؛ بۆق؛ مژی گەرما؛ هەڵمی ئاوی گەرم ٢. نمەبۆ؛ بۆنی گرانی تەڕی و ڕزاو لەبەر تەڕی 🇮🇷 ١. بُخار ٢. نا؛ بوی گند از رطوبت

**هەفان** / hefan/: ناو. جانەوەری چنگ بە بەردان سواو 🇮🇷 جانور سائیده چنگال

**هەفاندن** / hefandin/: چاوگ. ماندوو کردن؛ شەکەت کردن 🇮🇷 خسته کردن

**هەفت** / heft/: ☜ حەوت

**هەفتا** / hefta/: ☜ حەفتا[١]

**هەفتاڤ** / heftav/: ☜ هەفتاو

**هەفتانە** / heftane/: ☜ حەفتانە

**هەفتانی** / heftanî/: ☜ حەفتانە[١]

**هەفتاو** / heftaw/: ناو. هەفتاڤ؛ کار و ڕەوتی گلاو کردن؛ بە حەوت ئاو شوتن 🇮🇷 عمل هفت بار شُستن نجس

**هەفتبرا** / heftb(i)ra/: ☜ **حەوتەوانان**

**هەفتجار** / heftcar/: ناو. قرپۆق؛ قرپـک؛ قـورواق ☰ قورباغه

**هەفتجۆش** / heftcoş/: ☜ **حەوجۆش**

**هـەفتجـوش** / heftcûş/: نـاو. حـەوجۆش؛ حەفت‌جۆش؛ حەفجۆش؛ لوولینەی مـەفرەق ☰ آفتابەی مفرغی

**هـەفترِوو** / heftřû/: ئاوەڵـناو. [مـەجاز] حـەوت‌ڕوو؛ مەرایی‌کەر؛ ڕیاکار ☰ هفت‌رنگ

**هەفترِەنگیله** / heftřengîle/: ☜ **هەنگەچینە**

**هەفتک** / heftik/: ناو. پاشەڕۆکی میوە ☰ تەماندەی میوه

**هەفتلۆ**[١] / heftlo/: ناو. حـەوت‌لـۆ؛ پـەڕی قومـاری حەوت خاڵ ☰ ورق هفت خال گنجفه

**هەفتلۆ**[٢]: ئاوەڵناو. حەوت‌لـۆ؛ خـەو چـین لـە سـەر ئێکتر ☰ هفت لایه بر هم

**هەفتوێ** / heft(i)wê/: ناو. هەفتوێخ؛ حەوت‌تـوێ؛ حەوت چین لە سەر یەک ☰ هفت لایه

**هەفتوێخ** / heft(i)wêx/: ناو. ١. برینێکی زۆر پیس و تووشە ٢. ☜ **هەفتوێ** ☰ ١. نوعی زخم بـدخیم ٢. ☜ **هەفتوێ**

**هەفتوک**[١] / heftok/: ناو. گەمەیەکی زارۆکانـە ☰ از بازی‌های کودکانه

**هەفتۆک**[٢]: ئاوەڵناو. ١. ☜ **هەفتەیی** ٢. هەفتەکۆک؛ تایبەتمەنـدی سـەعاتێ کـە بـە حـەو ڕۆژ جـارێ قورمیش دەکرێ ☰ ١. ☜ **هەفتەیی** ٢. هفته کوک (ساعت)

**هەفتووە** / heftowe/: ☜ **ئەفتاوە**

**هەفتو**[١] / heftû/: ناو. هەفتە؛ حەوتوو ☰ هفته

**هەفتـو**[٢]: ئاوەڵـناو. هەفتـە: ١. خـەوتوو؛ نووسـتوو؛ خەفتگ ٢. حـەفلۆ؛ حـەوت لۆیـە ☰ ١. خُفتـه ٢. هفت لایه

**هەفتـوش** / heftûş/: نـاو. هــەفتوویش: ١. کـاری هانەدان بۆ جاڕز و تووڕە کردن ٢. ڕەوتی تـووش بە تووشەوە بوون ☰ ١. تحریک ٢. برخورد

**هەفتویش** / heftûyş/: ☜ **هەفتوش**

**هەفتە** / hefte/: ☜ **هەفتو**

**هەفتـەکۆک** / heftekok/: ئاوەڵـناو. هــەفتۆک؛ تایبەتمەندی سـەعاتێ کـە بـە حـەو ڕۆژ جـارێ قورمیش دەکرێ ☰ هفته‌کوک

**هەفتـەکێش** / heftekêş/: نـاو. کـاری لـە فـەحل کێشانی ماین و ماکەر لەو حەوتەدا کـە بێچـووی بـووە ☰ عمـل گشـن دادن مادیـان و ماچـەخـر در هفته‌ای که زاییده است

**هەفتـەن** / heften/: چاوگ. خـەوتن؛ نووسـتن ☰ خوابیدن

**هەفتەیـی** / hefteyî/: ئاوەڵناو. هـەفتۆک؛ هەفتانـە؛ حەفتەیی؛ حەوتەیانە ☰ هفتگی

**هـەفتیار** / heftyar/: نـاو. ١. کـەمتار؛ کـەمتیار؛ گۆڕنەباش ٢. [کینایە] ژنێ که دەگـەڵ زۆر پیـاوان ڕایدەبوێرێ ☰ ١. کفتار ٢. زنی که با مـردان زیـادی سروسر دارد

**هەفتیر** / heftîr/: ناو. جۆرێ دەمانچە کـە حـەوت فیشەک دەخوا ☰ هفت‌تیر

**هەفتیک** / heftîk/: نـاو. گەمەیـەکی زارۆکانـە بـە قاشولکە دەیکەن ☰ از بازی‌های کودکان

**هەفتێ** / heftê/: ☜ **حەفتا**[١]

**هەفدین** / hefdîn/: چاوگ. ١. داپۆشین؛ قەپاغ لـە سـەر دانـان (دەفـر و ...) ٢. بەسـتن؛ پێـوەدان (دەرک و ...) ☰ ١. درپوش گذاشتن (ظـرف و ...) ٢. بستن (در ...)

**هەفری** / hefrî/: ناو. جۆرێ ماسی ☰ نوعی ماهی

**هەفرید** / hefrîd/: ناو. عیفریت؛ دێو؛ زەبەلاحی ناو کۆنە چیرۆکان ☰ عفریت

**هەفس** / hefs/: ☜ **هەپس**

**هەفسار** / hefsar/: ☜ **هەوسار**

**هەفسخانە** / hefsxane/: ☜ **هەپس**

**هەفسی** / hefsî/: ناو. بەندی؛ گراو ☰ زندانی

**هەفشی** / hefşî/: ناو. حەوشە؛ پەچە؛ هەسارگەلە ☰ شبغاز

**هەفقاس** / hefqas/: ناوەلکار. حەفقاس؛ ئەوقاس؛ ئەوەند؛ ئەمەنگە ☰ این‌قدر

**هەفک** / hefik/: ناو. ١. ئەوک؛ قورگ ٢. مل؛ گەردن ☰ ١. بیخ گلو ٢. گردن

**هەفکئەستور** / hefik'estûr/: ناوەلناو. ملقەوی؛ ملپان ☰ گردن‌کُلُفت

**هەفکویک** / hefkiwîk/: ☜ **هەفکین**

**هەفکین** / hefkîn/: ناو. هەفکویک؛ ئاردێ کە ئەنگوتکی تێ وەردەدەن ☰ آردی کە چونە در آن گُذارند

**هەفل** / hefil/: ناو. قرتک و دارکی هێشووی ترێ و خورما ☰ چوب خوشەی انگور و خُرما

**هەفن** / hefn/: ناو. بۆگەن؛ بۆی گەنیو ☰ بوگند

**هەفنی** / hefnî/: ناوەلناو. گەنیو؛ گەنی؛ گەندر ☰ گندیدە

**هەفوری** / hefûrî/: ناو. ١. تەگە؛ خەرت؛ نێری فەحل ٢. شوور؛ فیلەگێژە؛ جۆرێ گامێشی دڕ ☰ ١. تکە ٢. نوعی گاومیش وحشی

**هەفهەفی** / hefhefî/: ناوەلناو. چاوچنۆک؛ لێشتۆک؛ تەماحکار ☰ آزمند

**هەفهەفیاتی** / hefhefyatî/: ناو. چلێسی؛ زکنی؛ چەورەیی ☰ شکم‌پرستی

**هەفی** / hefî/: ناو. گەورەمار؛ ئەژدەها ☰ مار بزرگ

**هەفیک** / hefîk/: ناو. ستۆکورک؛ ستۆکورک؛ ستۆکوڕ ☰ نای

**هەڤ**[1] / hev/: ناو. هەب؛ دەنک؛ دانە ☰ دانە

**هەڤ ـ**[2]: پێشگر. هەف ـ: ١. ئاوـ هاوـ شەریکی و وێچوون (دێتە سەر ناو) ‹هەڤسال؛ هەڤبەش› ٢. پێک ـ؛ دەگەڵ؛ پێکەوە (دێتە سەر ڕەگی کار و چاوگ) ‹هەڤیازی؛ هەڤجڤین› ☰ ١و٢. هم ـ ـ

**هەڤئاواز** / hev'awaz/: ناو. هەوای گۆرانی بە کۆمەڵ و ڕێکوپێک ☰ آواز گروهی

**هەڤئۆل** / hev'ol/: ☜ **هەڤۆل**

**هەڤار** / hevar/: ☜ **هەوار**

**هەڤاری** / hevarî/: ناو. هاوار؛ هانا؛ کۆمەگ؛ یاریدە ‹خودێ بە کوو د هەڤاریا من هات نەخۆ ئەز شەرپەزە بووم› ☰ یاری؛ کمک

**هەڤاز** / hevaz/: ناو. فەغوو؛ هاوار؛ نالە و گریان بە نیشانەی نارەزایەتی لە شتێ ☰ فغان

**هەڤاڤ**[1] / hevav/: ناو. کەسێ کە مالی لە کەنار دەریا یان لە قەراخ چۆمە ☰ ساکن کنار دریا یا رودخانە

**هەڤاڤ**[2]: ناوەلناو. هێمن؛ لەسەرخۆ ☰ آرام

**هەڤال** / heval/: ☜ **هاوال**

**هەڤالا** / hevala/: ناو. بەزمی بووک گوێزانەوە ☰ جشن عروسی

**هەڤالبچوک** / hevalb(i)çûk/: ناو. ١. منداڵدان؛ زێدان؛ پزدان ٢. ☜ **هەڤالۆک** ☰ ١. رَحِم ٢. ☜ **هەڤالۆک**

**هەڤالبەند** / hevalbend/: ناو. دۆستی سوێندخۆر و پەیماندەری ئاشنایەتی ☰ دوست قسم خوردە

**هەڤالپشت** / hevalpişt/: ناو. ئاواڵدوانەیەک کە ماوەیێ دوای ئەوی‌تریان لە دایک بووە ☰ دوقلویی کە آخر بە دنیا آمدە

**هەڤالجەو** / hevalcew/: ☜ **هەڤالزا**

**هەڤالجێو** / hevalcêw/: ☜ **هەڤالزا**

**هەڤالداری** / hevaldarî/: ناو. کاری لە سەر هەوال کردنەوە؛ پشتی دۆست گرتن ☰ پشتیبانی از رفیق

**هەڤالزا** / hevalza/: ناوەلناو. هەڤالجەو؛ هەڤالجێو؛ جمک؛ دوانە؛ ئاواڵدوانە ☰ دوقلو

**هەڤالزاڤا** / hevalzava/: ☜ **ئاوەڵزاوا**

**هەڤالکراس** / hevalk(i)ras/: ☜ **ئاوەڵکراس**

**هەڤالۆ / hevalo/**: سارستە. ئەی ئاواڵ؛ ئەی دۆس ☰ ای دوست

**هەڤالۆشک / hevaloşk/**: ناو. ئاواڵی زۆر نزیک و خۆشەویست ☰ دوست صمیمی

**هەڤالۆک / hevalok/**: ناو. هەڤاڵ‌بچووک: ١. سەراو؛ پەردەی منداڵدان ٢. هژی؛ هەواڵ‌منداڵ کە لە دوای زان دەبێ دەرکەوێ ☰ ١. کیسەی آب زائو ٢. جُفت نوزاد

**هەڤالە / hevale/**: ناو. هەڤالی؛ گۆرانی تایبەتی بەڕێ کردنی بووک ☰ ترانەی ویژەی راهی کردن عروس

**هەڤالەتی / hevaletî/**: ناو. هەڤالی؛ هەڤالینی؛ ئاوالەتی؛ دۆستایەتی ☰ دوستی

**هەڤالهەڤالانی / hevalhevalanî/**: ناو. ١. دۆسبازی؛ پشتی دۆستان گرتن و لە هەر کارێکدا ئەوان سەرخستن و حەق نانە لاوە ٢. دەستە ـ دەستە بوونەوە ☰ ١. رفیق‌بازی ٢. گروه ـ گروه شدن

**هەڤالی / hevalî/**: ناو. ١. ☜ هەڤالەتی ٢. ☜ هەڤالە

**هەڤالینی / hevalînî/**: ☜ هەڤالەتی

**هەڤاڵ / hevał/**: ☜ هاواڵ

**هەڤان[1] / hevan/**: چاوگ. حاوانەوە؛ حەسانەوە ☰ آسودن

**هەڤان[2]**: ناو. ١. ☜ هەنبانە ٢. ☜ ئاوان[1]ـ١

**هەڤان[3]**: ئاوەڵناو. عەوان؛ مایەفیتنە و شۆفار ☰ فتنه‌انگیز

**هەڤاندن / hevandin/**: چاوگ. حاواندنەوە ☰ پناه دادن

**هەڤانە / hevane/**: ☜ هەنبانە

**هەڤانی / hevanî/**: ناو. بەدفەڕی؛ شەیتانی ☰ شیطنت

**هەڤبازێری / hevbajêrî/**: ☜ هاوشاری

**هەڤبانگ / hevbang/**: ئاوەڵناو. هاودەنگ ‹هەڤبانگ و هەڤسازێ تە مە/ هەڤخوەندن و ڕازێ تە مە «جگەرخوێن»› ☰ همصدا

**هەڤبەحر / hevbeḧr/**: ئاوەڵناو. هەڤبەهر؛ هاوبەش ☰ شریک

**هەڤبەر / hevber/**: ئاوەڵناو. بەرانبەر؛ بەرامبەر؛ هەمبەر ☰ برابر

**هەڤبەرکی / hevberkî/**: ناو. کاری بەرانبەر پێ کردن؛ لە بەر یەک دانان ☰ مُقابله

**هەڤبەز / hevbez/**: ئاوەڵناو. ١. هاوڕۆژگار؛ هاوچەرخ ٢. هاوغار؛ هاوهەنگاو لە غارغارێندا ☰ ١. مُعاصر ٢. همگام در دویدن

**هەڤبەزم / hevbezm/**: ئاوەڵناو. ئامپیالە؛ هەواڵ و بەشدار لە خواردنەوەدا ☰ همپیاله

**هەڤبەست / hevbest/**: ناو. بەین؛ پەیمان؛ شەرت ☰ عهد؛ توافق

**هەڤبەش / hevbeş/**: ئاوەڵناو. هاوپاژ؛ هاوپشک؛ هاوبەش ☰ شریک

**هەڤبەشی / hevbeşî/**: ناو. شەریکە؛ شیرکەت ☰ شرکت

**هەڤبەند / hevbend/**: ئاوەڵناو. ١. هەواڵی زۆر نزیک ٢. هاوکار ٣. هاوزیندانی ☰ ١. دوست صمیمی ٢. همکار ٣. همبند

**هەڤبەندی / hevbendî/**: ناو. هاوکاری؛ هامکاری ☰ همکاری

**هەڤبەهر / hevbehr/**: ☜ هەڤبەحر

**هەڤپا / hevpa/**: ئاوەڵناو. ئامپا؛ هاوپلەوپایە ☰ هم‌درجه

**هەڤپار / hevpar/**: ئاوەڵناو. هەڤبەهر؛ هاوبەش؛ هاوپشک ☰ شریک

**هەڤپشت / hevpişt/**: ئاوەڵناو. پشتیوان؛ ئاریکاری باش ☰ پُشتیبان

**هەڤپشک / hevpişk/**: ئاوەڵناو. هەڤبەحر؛

هاوپشک ☰ شریک

**هەڤپشکی** / hevpişkî/: ناو. شـەریکی؛ هاوبەشـی ☰ شراکت

**هەڤپەیالە** / hevpeyale/: ☚ **هەڤپیالە**

**هەڤپیالە** / hevp(i)yale/: ئاوەلـناو. هـەڤ پەیالـە؛ هاودەم؛ هاواڵ و بەشدار لە خواردنەوە ☰ همپیاله

**هەڤپیشـە** / hevpîşe/: ئاوەلـناو. هاوسـنعات ☰ همپیشه

**هەڤتا** / hevta/: ☚ **هاوتا**

**هەڤتـایی** / hevtayî/: نـاو. هاوتـایی؛ هاوشـانی ☰ همتایی

**هەڤتۆنە** / hevtone/: ئاوەلناو/ ئاوەلکار. ئاوا؛ ئاوەها ☰ اینچنین

**هەڤتیرە** / hevtîre/: ئاوەلناو. هاوهۆز؛ هاوعاشیرەت؛ لە یەک تیرە و بنەچەکە ☰ همطایفه

**هەڤجاڕ** / hevcař/: ناو. نیر و ئاموور ☰ خیش

**هەڤجڤات** / hevc(i)vat/: ئاوەلناو. هاوکار لە کۆڕی کۆ بوونەوەدا ☰ همکار در انجمن و گردهمایی

**هەڤجڤانـدن** / hevc(i)vandin/: چـاوگ. کـۆ کردنەوەی کۆمەڵی مەردم لە شوێنێک ☰ گرد آوردن جمعیت در یک جا

**هەڤجڤین** / hevc(i)vîn/: چاوگ. کۆ بوونەوە؛ گرد بوونەوە ☰ گرد هم آمدن

**هەڤجووت**[1] / hevcût/: ناو. هاوشانی؛ هاونرخی ☰ همتایی؛ همارزی

**هەڤجووت**[2]: ☚ **هاوجووت**

**هەڤجوورە** / hevcûre/: ئاوەلناو. تەواو لە چەشن ☰ کاملاً مشابه

**هەڤجە** / hevce/: نـاو. پێویسـتی؛ ئەوەجـە ☰ ضرورت

**هەڤجی** / hevcî/: ناو. هاوولاتی ☰ همشهری

**هەڤجیتی** / hevcîtî/: نـاو. هاونیشـتمانیەتی ☰ همشهریگری

**هەڤچاخ** / hevçax/: ☚ **هاوچەرخ**

**هەڤچاڤ** / hevçav/: ئاوەلناو. چاڤـێر؛ چـاودێر ☰ مُراقب

**هەڤچاڤی** / hevçavî/: ناو. چاڤـێری؛ چـاودێری ☰ مُراقبت

**هەڤخستن** / hevxistin/: چاوگ. لێکدان؛ لە یەکتر دان ☰ همدیگر را زدن

**هەڤخوو** / hevxû/: ئاوەلناو. ئاکـار و خـدە وەکـوو یەکتر ☰ همخو

**هەڤخەو** / hevxew/: ☚ **هاوسەر**[1]ـ١

**هەڤد** / hevd/: ناو. ١. ☚ **حەڤدە** ٢. هەودا؛ ڕیس ☰ ١. ☚ **حەڤدە** ٢. رشته؛ نخ

**هەڤداخستن** / hevdaxistin/: چاوگ. یـەکتر لـە عەردی دان لە زۆرەبانیدا ☰ همدیگر را در کشتی بر زمین زدن

**هەڤدار** / hevdar/: ئاوەلناو. هاوپـاژ؛ هاوپشـک؛ هاوبەش ☰ شریک

**هەڤدان** / hevdan/: چاوگ. لێک کـۆ کردنـەوە ☰ به دور هم جمع کردن

**هەڤدل** / hevdil/: ئاوەلناو. هاودڵ؛ ئەوانەی دڵـیان بۆ یەک دێنێ ☰ همدل

**هەڤدوو** / hevdû/: جێناو. هەڤدی؛ ئێکتر؛ یەکتر ☰ همدیگر

⊡ **هەڤدوو برن**: کێبەرکێ کردن؛ ملـە کـردن ☰ رقابت کردن

**هەڤدوو دان**: لە دووی یەک هاتن؛ یەک لە پاش یەک هاتن ☰ به دنبال هم آمدن

**هەڤدوو دانین**: لێکدانی چەنـد شـتێ ☰ ترکیـب کردن

**هەڤدوو دیتن**: چاو بە یەکتر کەوتن ☰ همدیگر را دیدن

**هەڤدوو گرتن**: ١. یـەکت گـرتن ٢. یـەکتر

گرتنەوە 🇮🇷 ١. مُتحد شدن ٢. به هم رسیدن

**هەڤدور** / hevdûr/: ئاوەڵناو. لێکهەڵبڕاو 🇮🇷 ازهم بُریده

**هەڤدوری** / hevdûrî/: ناو. ڕەوتی لێک هەڵبڕان 🇮🇷 هجران

**هەڤدە** / hevde/: ☜ حەڤدە

**هەڤدەرد** / hevderd/: ☜ هاودەرد

**هەڤدەسازی** / hevdesazî/: ناو. ڕێخراوە؛ ڕێکخراوە 🇮🇷 سازمان

**هەڤدەست** / hevdest/: ئاوەڵناو. یاریدەر؛ ئاریکار 🇮🇷 یاور

**هەڤدەڤ** / hevdev/: ☜ هاودەم

**هەڤدەل** / hevdel/: ناو. ١. شۆرباوئارد؛ ئارد و ئاوی پێکەوە کولاو ٢. /کینایە/ تێکەڵ ـ پێکەڵی؛ بێ سەرەوبەرەیی 🇮🇷 ١. مخلوط آرد و آب جوشیده ٢. درهم‌برهمی

**هەڤدەم** / hevdem/: ئاوەڵناو. ١. ☜ هاودەم ٢. ☜ هاوچەرخ

**هەڤدەن** / hevden/: ناو. کێشی هەڵبەست 🇮🇷 وزن شعر

**هەڤدەنگ**[١] / hevdeng/: ناو. هاوبیچم؛ چەند واتایەکی لێک جیا لە یەک وشەدا 🇮🇷 معانی مختلف یک کلمه

**هەڤدەنگ**[٢]: ئاوەڵناو. ١. ئاودەنگی؛ خەمڕەوێن ٢. لە بیر و باوەڕدا وەک یەک 🇮🇷 ١. غمگُسار ٢. همفکر

**هەڤدەهی** / hevdehî/: ☜ حەڤدەهەم

**هەڤدی** / hevdî/: ☜ هەڤدو

**هەڤدین** / hevdîn/: ئاوەڵناو. هاودین؛ هاوئایین 🇮🇷 همدین

**هەڤر** / hevr/: ☜ هەور

**هەڤرات** / hevrat/: ئاوەڵناو. زاناف؛ هاوشێوە؛ لە یەک چوو 🇮🇷 شبیه

**هەڤراز** / hevraz/: ناو. ١. ☜ هەوراز ٢. هەل؛ دەرفەت 🇮🇷 ١. ☜ هەوراز ٢. فُرصت

**هەڤران** / hevran/: ناو. سپیدار؛ سپیندار 🇮🇷 سپیدار

**هەڤردە** / hevirde/: ☜ هەوێردە

**هەڤرس** / hevris/: ناو. هەڤرست؛ دارێکی کێوی گەلا دەرزییە لە سنۆبەر دەکا 🇮🇷 درختی شبیه صنوبر

**هەڤرست** / hevrist/: ناو. ١. ☜ هەڤرس ٢. هۆندراو؛ هۆنە 🇮🇷 ١. ☜ هەڤرس ٢. بافته

**هەڤرگ** / hevrig/: ناو. جەرگ و هەناو 🇮🇷 دل و جگر

**هەڤرنگ** / hevring/: ☜ هەورنگ

**هەڤروشی** / hevruşî/: ناو. شەڕ فرۆشی؛ دۆخی ئاوڕیش بوون 🇮🇷 ستیزەجویی

**هەڤرونگ** / hevrung/: ناو. ١. وەرز؛ کەش؛ فەسل ٢. جەنگە؛ هەڕەت 🇮🇷 ١. فصل ٢. موسم

**هەڤرۆنگ** / hevrong/: ناو. وەرز؛ کەژ 🇮🇷 فصل

**هەڤرەمیش** / hevremîş/: ☜ هەورێشم

**هەڤری**[١] / hevrî/: ناو. ئەو وردەخۆراکە بە ددان و پووکەوە دەمێنێتەوە 🇮🇷 پسماندەی خوراک روی دندان و لثه

**هەڤری**[٢]: ئامراز. وەکی؛ وەکوو 🇮🇷 مانندِ

**هەڤریس** / hevrîs/: ☜ هەورس

**هەڤریسک** / hevrîsk/: ☜ هەورس

**هەڤریشک** / hevrîşk/: ☜ هەرمێشك

**هەڤریشم** / hevrîşim/: ☜ هەورێشم

**هەڤرینگ** / hevrîng/: ☜ هەورنگ

**هەڤڕ** / heviř/: ناو. ئیربار؛ قاپ و قاچاغی گلین 🇮🇷 ظروف سُفالی

**هەڤڕا** / hevřa/: ئاوەڵکار. پێکەوە؛ بە یەکەو 🇮🇷 با هم

**هەڤڕان** / hevřan/: ناو. باراش؛ بارە دەخڵێ کە بۆ هاڕین دەبرێتە ئاسیاو 🇮🇷 بار غلەی ویژەی آسیاب

**هەڤڕایی** / hevřayî/: ناو. هاوبەشی؛ شەریکەی

بازرگانی 🇮🇷 شرکت تجارتی

**هەڤرک** / hevřik/: ناو. ١. ملەکەر؛ بەربەرەکانێکەر ٢. کێبەرکێکار 🇮🇷 ١. رقیب ٢. حریف (در بازی)

**هەڤرکی** / hevřikî/: ناو. بەربەرەکانێ؛ ڕکابەری 🇮🇷 رقابت

**هەڤرو** / hevřû/: ئاوەڵناو/ ئاوەڵکار. بەرەوڕوو؛ بەرامبەر 🇮🇷 روبرو

⊡ **هەڤرو کرن**: بەرەوڕوو کردنەوە 🇮🇷 روبرو کردن

**هەڤرە** / hevře/: ئاوەڵکار. پێکرا؛ تێکڕا؛ تەڤ 🇮🇷 با هم

**هەڤرەنگ** / hevřeng/: ☜ هاوڕەنگ

**هەڤرەنگی** / hevřengî/: ☜ هاوڕەنگی

**هەڤری** / hevřî/: ☜ هاوڕێ

**هەڤریز** / hevřîz/: ☜ هاوڕیز

**هەڤریش** / hevřîş/: ☜ هاوڕیش

**هەڤرێ** / hevřê/: ☜ هاوڕێ

**هەڤرێک** / hevřêk/: ☜ هاوڕێ

**هەڤزا** / hevza/: ئاوەڵناو. هاوزا؛ هاوعومر؛ هاوتەمەن 🇮🇷 هم سن و سال

**هەڤزار** / hevzar/: ☜ هاوزمان

**هەڤزاڤا** / hevzava/: ☜ ئاوەڵزاوا

**هەڤزک** / hevzik/: ئاوەڵناو. جمک؛ دوانە؛ جێفی 🇮🇷 دوقلو

**هەڤزمان** / hevz(i)man/: ☜ هاوزمان

**هەڤژالە** / hevjałe/: ناو. هەوایەکی گۆرانی و لاوکە 🇮🇷 آهنگی است

**هەڤژین**[1] / hevjîn/: چاوگ. سەرگەرم بوون لە کارەوە؛ خەریک بوون 🇮🇷 سرگرم کار شدن

**هەڤژین**[2]: ناو. هاوبەش لە ژیاندا 🇮🇷 شریک زندگی

**هەڤسار** / hevsar/: ☜ هەوسار

**هەڤساز** / hevsaz/: ئاوەڵناو. بساز؛ سازگار 🇮🇷 سازگار

**هەڤسال** / hevsal/: ☜ هاوچەرخ

**هەڤسرین** / hevs(i)rîn/: چاوگ. ڕەق بوون لە سەرمان 🇮🇷 از سرما یخ زدن

**هەڤسۆژ** / hevsoj/: ئاوەڵناو. خەمخۆر؛ دڵسۆز؛ یاری خۆشی و ناخۆشی. هەروەها: **هەڤسۆزی** 🇮🇷 دلسوز

**هەڤسۆند** / hevsond/: ☜ هاوسوێند

**هەڤسەر**[1] / hevser/: ☜ هاوسەر[1]ـ١

**هەڤسەر**[2]: ئاوەڵناو. بەرانبەر؛ بەرامبەر؛ هەمبەر 🇮🇷 برابر

**هەڤسی** / hevsî/: ناو. جیرانی دەرک بە دەرکەوە 🇮🇷 همسایەی دیوار به دیوار

**هەڤسیایی** / hevs(i)yayî/: ☜ هاوسێتی

**هەڤسینور** / hevsînûr/: ☜ هاوسنوور

**هەڤشاری** / hevşarî/: ☜ هاوشاری

**هەڤقاس** / hevqas/: ئاوەڵکار. هندە؛ ئەوەندە 🇮🇷 این/ آن‌قدر

**هەڤکاری** / hevkarî/: ☜ هاوکاری

**هەڤگوهارتن** / hevguhartin/: چاوگ. پێک گۆڕینەوە 🇮🇷 مُعاوضه کردن

**هەڤگوهاستن** / hevguhastin/: چاوگ. جێگە پێک گۆڕینەوە 🇮🇷 جا عوض کردن

**هەڤگەل** / hevgel/: ئامراز. باتی؛ لە جیاتی 🇮🇷 در عوض

**هەڤگەلی** / hevgelî/: ناو. کار و ڕەوتی پێک گۆڕینەوە 🇮🇷 مُعاوضه

**هەڤگهان** / hevgihan/: چاوگ. ١. پێکهاتن؛ پێکاتن ٢. بە یەکتر گەیشتن 🇮🇷 ١. توافق کردن ٢. به هم رسیدن

**هەڤگهاندن** / hevgihandin/: چاوگ. ١. گەیاندنە یەکتر ٢. گەیاندنەوە بە یەکتر 🇮🇷 ١. به هم رساندن ٢. باز به هم رساندن

**هەڤلنگ** / hevling/: ناو. هاوزاوا؛ ئاوەڵزاوا 🇮🇷 باجناق

**هەڤلیز** / hevlîz/: ☜ **هاوکایە**

**هەڤمال**[1] / hevmal/: ناو. جیران؛ هاوسا ☲ همسایە

**هەڤمال**[2]: ئاوەڵناو. شەریکەبەش؛ برابەش لـە ماڵـدا ☲ شریک در اموال خانوادە

**هەڤمانا** / hevmana/: ☜ **هاومانا**

**هەڤناسین** / hevnasîn/: چاوگ. ١. پێکـەوە بوونـە ئاشنا ٢. یەکتر ناسینەوە ☲ ١. با هم آشنا شدن ٢. یکدیگر را بازشناختن

**هەڤناڤ** / hevnav/: ☜ **هاوناو**

**هەڤنشین** / hevn(i)şîn/: ☜ **هاودەم**

**هەڤنڤیس** / hevnivîs/: نـاو. دۆسـیە؛ کۆمەڵـە قاقەزی نووسراو لای میری لە بـارەی کەسـێ یـا کارێکەوە ☲ پروندە

**هەڤودن** / hevudin/: ئاوەڵـکار. پێکـەوە؛ دەگـەڵ یەکتر ☲ با هم؛ بە اتفاق

**هەڤودو** / hevudû/: ئاوەڵکار. پێکەوە (دووبەدوو) ☲ با هم (ما دو نفر)

**هەڤۆ** / hevo/: ناو. پۆ؛ فرێت ☲ پود

**هەڤۆت** / hevot/: نـاو. کار و ڕەوتی فێـر کـردن ☲ تعلیم

**هەڤۆتکار** / hevotkar/: نـاو. ١. فێرکـەر؛ فێرکـار؛ مامۆستا؛ سەیدا ٢. ڕاهێنەر؛ بارهێنەر ☲ ١. مُعلـم ٢. مربی

**هەڤۆتن** / hevotin/: چـاوگ. ١. فێـر کـردن؛ ڕاهێنان ‹ئەڤ گایێ مـن نەهەڤـۆتیە جوحتـێ› ٢. هاڤۆتن؛ فێر بوون ‹هۆستایێ عیشـقێ دل هەڤـۆت/ سەر تا قەدەم هنگی دسۆت «مەلای جزیری»› ☲ ١. تعلیم دادن ٢. یاد گرفتن

**هەڤۆتی** / hevotî/: ئاوەڵـناو. ڕاهێنـراو؛ فێرکـراو ☲ تعلیم‌دیدە

**هەڤۆر** / hevor/: ناو. کوور؛ بزنی دوو ساڵان ☲ بُـز دوسالە

**هەڤۆری** / hevorî/: ☜ **هەوری**[1]**ـ٣**

**هەڤۆک** / hevok/: ناو. ١. هەڤەک؛ ڕستە ٢. پارچە شیعر ☲ ١. جُملە ٢. قطعە شعر

▣ **هەڤۆکا بسەرخۆ**: ڕستەی تەواو ☲ جُملەی کامل

**هەڤۆکا ڕێزکری**: زنجیرە ڕستە ☲ جُملات مُتوالی

**هەڤۆکا فەرمانێ**: ڕستەیێ کە فەرمان بـە کـارێ دەدا ☲ جُملەی امری

**هەڤۆکا ناڤێ**: ناوە ڕستە ☲ جُملەی اسمی

**هەڤۆکا هەکەیێ**: ڕسـتەی مـەرج و شـەرت ☲ جُملەی شرطی

**هەڤـۆل** / hevol/: ئاوەڵـناو. *[سوورکەڵـە]* هـەڤـئـۆل؛ هاودین؛ هاومەزەب. هەروەها: **هەڤۆلی** ☲ هم‌دین

**هەڤوت** / hevût/: ناو. هین؛ هووین؛ فێرکـاری ☲ آموزش

**هەڤـوتن** / hevûtin/: چـاوگ. فـڕ کـردن؛ نیانـە سەرەوە ☲ سرکشیدن

**هەڤوراندن** / hevûrandin/: چاوگ. فراوان کردن؛ گوشاد کردن ☲ فراخ کردن

**هەڤە** / heve/: ☜ **هەوە**[2]

**هەڤەر** / hever/: ئاوەڵـناو. بەڵـەک؛ بـازگ؛ ڕەش و سپی (بزن) ☲ خلنگ (بُز)

**هەڤەرە** / hevere/: ناو. ڕۆژ؛ خۆر ☲ خورشید

**هەڤەک** / hevek/: ☜ **هەڤۆک ـ١**

**هـەڤهـاتن** / hevhatin/: چـاوگ. یـەکتر گـرتن؛ پێکهاتن ☲ مُتحد شدن

**هەڤهەسو** / hevhesû/: ئاوەڵناو. بەرانبـەر؛ هەمبـەر ☲ برابر؛ مُقابل

**هەڤی** / hevî/: ☜ **هەوێ**

**هەڤیاز** / hevyaz/: ئاوەڵناو. لەسەر؛ بانتر؛ سەرتر ☲ برتر

**هەڤیازی** / hevyazî/: ناو. سەرپشکی ☲ امتیاز

**هەڤیان** / hevyan/: نـاو. ١. ئـۆقرە؛ هـەدا ٢. ☜ هەوێن ☲ ١. آرامش ٢. ☜ **هەوێن**

▣ **هەڤیان بوون**: ١. هێدی بوونەوە؛ ئـۆقرە گـرتن

٢. هەڤێن بوونی شیر ☰ ١. آرام گرفتن ٢. بند آمدن شیر

**هەڤیان کرن:** مەیاندن؛ هەوێن کردن ☰ شیر را مایە زدن

**هەڤیر / hevîr/:** ☜ **هەویر**

**هەڤیربڕی / hevîrb(i)ř̂î/:** ناو. شێوێکە لە نیسک و گزموولە هەویر ☰ آش عدس و خمیر

**هەڤیرترش / hevîrtirş/:** ☜ **هەویرترش**

**هەڤیرشێل / hevîrşêl/:** ☜ **هەویرشێل**

**هەڤیرکەر / hevîrker/:** ☜ **هەویرشێل**

**هەڤیرۆ / hevîro/:** ناو. هەڤیری هەڵنەهاتوو ☰ خمیر برنیامده

**هەڤیرکە / hevîřke/:** ناو. ١. ئالی؛ دەوروبەر ٢. گەو؛ کەمە؛ ئاڵقە ☰ ١. اطراف و حوالی ٢. حلقه

**هەڤیساندن / hevîsandin/:** چاوگ. هەوساندن؛ فێر کردن ☰ آموختن

**هەڤیسین / hevîsîn/:** چاوگ. فێر کران/ بوون ☰ آموختن

**هەڤین / hevîn/:** ناو. ١. ☜ **هەوێن** ٢. ئەڤین؛ دڵداری ☰ ١. ☜ **هەوێن** ٢. دلدادگی

**هەڤیندار / hevîndar/:** ☜ **ئەڤیندار**

**هەڤینداری / hevîndarî/:** ☜ **ئەڤینداری**

**هەڤینگەرم / hevîngerm/:** ناوەڵناو. شێت و هار لە دڵداریدا ☰ واله

**هەڤینی / hevînî/:** ناو. ژیانی دوو هەڤی پێکەوە ☰ زندگی دو هَوو با هم

**هەڤیەک / hevyek/:** ناوەڵناو. بەرانبەر؛ لە یەک پلەدا ☰ مساوی

**هەڤێرکە / hevêrke/:** ناو. دۆراندۆر؛ دۆرمادۆر ☰ پیرامون

**هەڤێرکی / hevêrkî/:** ناو. ئاڵقە ☰ حلقه

**هەڤێز / hevêz/:** ناو. پەچە؛ هەوێز؛ حەوشەمەڕ ☰ شبغاز

**هەڤێشک / hevêşk/:** ناو. چیلکە و هەژگەڵ ☰ شاخەی خُشک درختان

**هەق / heq/:** ☜ **حەق**

◙ **هەقێ قەڤدی:** خەلاتی سەر پالە لە بەرانبەری کارێ کە کردوویە ☰ انعام سردستەی دروگران

**هەقاندن / heqandin/:** چاوگ. دانەوە؛ کۆڵین؛ هەڵکەندن ☰ کندن؛ حفر کردن

**هەقانەت / heqanet/:** ☜ **هەقانییەت**

**هەقانی / heqanî/:** ناوەڵناو. ڕاست و دروست؛ سەرڕاست ☰ بەحق

**هەقانییەت / heqanîyet/:** ناو. هەقانەت؛ ڕاستی و ڕەوایی ☰ حقانیت

**هەقایەت / heqayet/:** ناو. هیقایەت؛ هیکایە؛ چیرۆک؛ حیکایەت ☰ حکایت

**هەقبە / heqbe/:** ☜ **هەگبە**

**هەقبێژ / heqbêj/:** ☜ **هەقگۆ**

**هەقدار / heqdar/:** ناوەڵناو. خاوەن هەق ‹ئێستاش بە قسەدا هەر خۆی هەقدارە/ دروستە دز بێ خاوەن حەزارە! «هەژار، *بۆکوردستان*»› ☰ حقدار

**هەقدەس / heqdes/:** ☜ **هەقدەست**

**هەقدەست / heqdest/:** ناو. هەقدەس؛ کرێ؛ مز ☰ دستمُزد

**هەقکەنا / heqkena/:** نزا. بەشقی خودا؛ لە ڕێ خودا ☰ به خاطر خدا

**هەقگۆ / heqgo/:** ناوەڵناو. ڕاستبێژ؛ هەقبێژ ‹درۆزن بۆی بزر بوو، هاتە مەیدان/ کچی ئازا، کوڕی لێزان و هەقگۆ «هێمن»› ☰ حقگو

**هەقلەمانی / heqlemanî/:** ناو. هەقلیمەقۆ؛ کەلەمستێن؛ پشکیلان ☰ گُل یا پوچ

**هەقلیمەقۆ / heqlîmeqo/:** ناو. ١. ☜ **هەقلەمانی** ٢. هەرا ـ هەرا؛ زەنا ـ زەنا ٣. حینەدرحۆ؛ ئەمسەر ـ ئەوسەر ☰ ١. ☜ **هەقلەمانی** ٢. جار و جنجال ٣. آلاکلنگ

**هەقڵ** / heqł/: ☜ **عەقڵ**

**هەقمەق** / heqmeq/: ئاوەڵناو. نەزان؛ نەفام؛ بێئاوەز ☰ احمق

**هەقوەستێن** / heqwestên/: ئاوەڵناو. ١. باش و ڕاست ‹خوا هەڵناگرێ، کاری تۆ هەقوەستێن بوو› ٢. تۆڵەسێن ☰ ١. صحیح ٢. انتقامگیر

**هەقۆ** / heqo/: نزا. خوایە؛ ئەی خودا ☰ خدایا

**هەقە** / heqe/: ناو. ١. کاکەیی؛ یارسا؛ نوالە ٢. مریدانی شێخی شەدەڵە ٣. *[کینایە]* فێڵ؛ گزی ☰ ١. اهل حق ٢. فرقەای در کردستان ٣. دوز و کلک؛ حُقه

**هەقەباز** / heqebaz/: ☜ **هۆقەباز**

**هەقەپەڵە** / heqepełe/: ناو. پەڵەباران لە مانگی گەڵاڕێزان ☰ باران آبان‌ماهی

**هەقهەقکەرە** / heqheqkere/: ناو. تاق‌تاق؛ تاک‌تاک‌کەرە ☰ مُرغ حق

**هەقیڤ** / heqîv/: ناو. هەگبە؛ خورجی چکۆلە کە لە پشت سوارەوە، لە سەر پشت و سمتی یەکسم داندراوە ☰ خورجین ترک سوار

**هەقیقە** / heqîqe/: ناو. کاوڕ یان شەکێ کە بە هۆی حەوتمی هاتنە دونیای زارۆ، سەری دەبڕن ☰ عقیقە

**هەقیقەت** / heqîqet/: ناو. ڕاستی؛ پێچەوانەی درۆ ‹هەقیقەت وەکوو تاوە، هەر دەردەکەوێ «قسەی نەستەق»› ☰ حقیقت

**هەک**[1] / hek/: ناو. هەگ؛ تەقلە؛ بلق ☰ حُباب

**هەک**[2]: ئامراز. هەک؛ ئەگەر ☰ اگر

**هەک**[3]: دەنگ. هەک: ١. حەک؛ پەک؛ وشەی سەیرمان ‹هەک ماڵت نەشێوێ بۆ تاقەتت!› ٢. دەک؛ وتەی سەرکۆنە ‹هەک لەو جوابە نابەجێیە!› ٣. وتەی نفرە ‹هەک خۆفرۆش نەمێنی!› ☰ ١. وا ٢. حرف سرزنش ٣. حرف تنفُر

**هەکانی** / hekanî/: ئاوەڵناو. هەکینی؛ شەرتی؛ بە مەرج و شەرت ☰ شرطی

**هەککو** / hekkû/: ئامراز. هەکوو؛ پەککوو ☰ وە

**هەکڵ** / hek(i)ł/: ناو. عەقڵ؛ فام ‹نەک تۆ پەرێش دیڤۆنە بی، هەکلیت بەرۆ، بێگانە بی/ تە پەی شەمەی پەرڤۆنە بی، پی تە نەدا سۆتارە بە «سەیدی»› ☰ عقل

**هەکڵمەکڵ** / hek(i)łmek(i)ł/: ☜ **هەتۆڵمەتۆڵ**

**هەکڵومەکڵ** / hek(i)ł û mek(i)ł/: ☜ **هەتۆڵمەتۆڵ**

**هەکوک** / hekuk/: ناو. مێلوک؛ شیرین‌بەلەک؛ شیرین‌بەیان ☰ شیرین‌بیان

**هەکۆکە** / hekoke/: ناو. کوێرەکانی کە پاش بەهار وشک دەکا ☰ چشمەی فصلی

**هەکو**[1] / hekû/: ئامراز. ئەگەر؛ هاتوو ☰ اگر

**هەکو**[2]: ☜ **هەککو**

**هەکە**[1] / heke/: ناو. ١. *[شوورەیی]* ئالۆش؛ خورووی لەش لە تاوی مەیلی جینسی ٢. بەق؛ نێرەکەو ٣. باڵندەی ماڵی ٤. باڵداری کێوی ☰ ١. خارش تن از شدت شهوت ٢. کبک نر ٣. ماکیان ٤. پرندە

**هەکە**[2]: ئامراز. ئەگەر ☰ اگر

**هەکەدار** / hekedar/: ئاوەڵناو. *[شوورەیی]* حەکەدار؛ بە ئالۆش ☰ خشَری

**هەکینی** / hekînî/: ☜ **هەکانی**

**هەکینێ** / hekînê/: ئامراز. ئەگەرکوو ☰ اگر کە

**هەگ** / heg/: ☜ **هەك**

**هەگبە** / hegbe/: ناو. هەقبە؛ خورجینی دووتایی چکۆلە کە لە پشت سوارەوە لە زین قایم دەکرێ ‹دابەزی قاوەڵتی ئەکرد/ هەگبەی لە سەر حوشتر داگرت «پیرەمێرد»› ☰ خورجین پُشت زین

**هەگبەزین** / hegbezîn/: ناو. خورجەزین؛ توورەکەی دوولایی کە لە پاش زینەوە هەڵدەواسرێ ☰ خُرج زین

**هەگلە** / hegle/: ناو. گابەرد؛ تەلەسەنگ ☰

خرسنگ

**هەگەر**[1] / heger/: ناو. هۆ؛ سەبەب ☰ علت

**هەگەر**[2]: ئامراز. ئەگەر ☰ اگر

**هەل**[1] / hel/: ناو. ١. دەرفەت؛ فرسەت ‹هەلە، پارانەوە ئەمڕۆ، زوبان و دڵ لە کارایە/ زوبانئاوەر کە بەستەزمانە سبحەینێ کە قووچا دەم «مەحوی»› ٢. جار؛ چەل ‹وا ئەو هەلەش لێتان خۆش بوو. خودا خاوەنی چاکەیە لە سەر خاوەن باوەڕەکان «هەژار، قورئان»› ٣. نۆرە؛ نۆبە ‹شکا بێگانە، پالاوتی لە ترسان/ کوڕی کورد! هاتەوە دیسان هەلی تۆ «هێمن»› ٤. *[باوەڕی کۆن]* فریشتەی ئاگاداری لێڕەوار؛ خێوی جەنگەڵ و دارستان ٥. حەل؛ زانینی وشە و مەسەلەی دژوار ٦. هاڵ؛ ڕەنگ بووڵ ٧. دەم؛ کات ٨. دەمی نیمەڕۆ ☰ ١. فُرصت ٢. بار؛ دفعه ٣. نوبت ۴. فرشتەی نگهبان جنگل ۵. حل معما ۶. طوسی رنگ ٧. دم؛ وقت ٨. هنگام نیمروز

⊡ **هەل بە دەرفەت زانین**: بەهرە بردن لە فرسەتی دەسکەوتوو ☰ فُرصت را غنیمت شمردن

**هەل ڕەخسان**: هەل ڕەخسین؛ دەرفەت دەسکەوتن ☰ فُرصت یافتن

**هەل ڕەخسین**: ☜ **هەل ڕەخسان**

**هەل**[2]: ئاوەڵناو. هاڵ؛ ڕەنگ بووڵ ☰ طوسی رنگ

**هەل ـ**[3]: ☜ **هل ـ**[2]

**هەلا** / hela/: ناو. ١. هەرا؛ دەنگی بەقەو ٢. لا؛ کەنار ☰ ١. فریاد ٢. کنار

⊡ **هەلا کەوتن**: وەلا کەوتن؛ چوونە کەنار ☰ کنار رفتن

**هەلاب** / helab/: ☜ **هلاب**

**هەلاباجی** / helabacî/: ناو. گەمەیەکی زارۆکانە تلی شادەی دەستی ڕاست لە ناو لەپی دەستی چەپا ئەسووڕێنن ڕەسمی شتێک بە خەیاڵ دەکەن کە ئەیانەوێ ☰ بازی شبیه لی‌لی حوضک

**هەلات** / helat/: ناو. ١. درۆی زل ‹ئەم قسە هەر درۆ نییە، هەلاتە!› ٢. بافیش؛ شاتوشووت؛ کاری خۆ هەڵکێشان ☰ ١. دروغ شاخدار ٢. لاف؛ خودستایی

**هەلاج** / helac/: ناو. ١. قەبسکۆر؛ کەسێ کە بە کوتک و کەوان کولکە و خوری شی دەکاتەوە ٢. هاتوچۆ بە دالەقاوی ☰ ١. حلاج؛ پنبەزن ٢. نوسان

**هەلاجان** / helacan/: چاوگ. هەلاجین؛ ڕاژان بە حەواوە ☰ نوسان کردن

**هەلاجاندن** / helacandin/: چاوگ. ڕاژاندن بە حەواوە ☰ نوسان دادن

**هەلاجی** / helacî/: ناو. کاری کولکە شی کردنەوە. هەروەها: **هەلاجی کردن** ☰ حلاجی؛ پنبەزنی

**هەلاجیکراو** / helacîkiraw/: ئاوەڵناو. ١. شیکراو؛ شیکراوە؛ لەبەریەک هەڵوەشاوی خوری و موو ٢. *[مەجاز]* باش تاوتوێ کراو ☰ ١و٢. حلاجی‌شده

**هەلاجین** / helacîn/: ☜ **هەلاجان**

**هەلار**[1] / helar/: ناو. هالاو؛ تینی ئاگر ☰ گرمای آتش

**هەلار**[2]: ئاوەڵناو. هەلا؛ لە بەریەک چووی ڕزاو ☰ پوسیده

**هەلاشانی** / helaşanî/: ناو. پاش نیمەڕۆ ☰ بعدازظهر

**هەلاڤیتن** / helavîtin/: چاوگ. بەرەو ژوور ئاویتن ☰ به سوی بالا انداختن

**هەلاڤیتی** / helavîtî/: ئاوەڵناو. بەرەو ژوور ئاویژراو ☰ به بالا انداخته شده

**هەلاک** / helak/: ئاوەڵناو. ١. هیلاک؛ نەخۆشی زۆر حاڵ خراب ٢. هیلاک؛ شەکەت؛ ماندوو ٣. مردوو؛ مردگ؛ تیاچووگ ☰ ١. بیمار مُحتضر ٢. خسته ٣. مُرده

**هەلاکان** / helakan/: چاوگ. کەوتنە خنەخن؛ پشوو سوار بوون لە بەر ماندوویی ☰ به هِن هِن

افتادن

**هەلاکـەت / helaket/**: نـاو. ١. دۆخ و چۆنیـــەتی مردن ٢. ماندوویی لـە ڕادەبـەدەر ◄ ١. مـرگ ٢. خستگی مُفرط

▣ **کەوتنـە هەلاکـەت**: چوونـە شـەرای مـەرگ؛ یەکجار زۆر ماندوو بـوون ◄ مـرگ خـود را بـە چشم دیدن

**هەلال[١] / helal/**: ناو. ١. گوڵی سمـڵ ٢. پیفـۆک؛ کیفۆک ◄ ١. گُل میخک ٢. گیاهی با پیاز خوردنی

**هەلال[٢]**: ☜ حەڵاڵ

▣ **هەلالـەی سەرۆ**: حەڵاڵـی شـەرعی ◄ حـلال شرعی

▣ **هەلالەی واشتش**: حەڵال کردن ◄ حلال کردن

**هەلالزادە / helalzade/**: ☜ حەڵاڵزادە

**هـەلالک / helalik/**: نـاو. هلـهلووک؛ هـەلالووک؛ هەلهـەلاک؛ هەلهـەلۆک؛ بەلالـووکە کێویلـە ◄ آلبالوی کوهی

**هەلالوک / helalûk/**: ☜ هەلالك

**هەلامە / helame/**: ناو. گیادۆکلێو کە لە چێشتانی دەکەن ◄ گیاهی آشی

**هەلان / helan/**: ناو. ١. گورە؛ نەعرەتە ٢. پختۆک؛ خام؛ بەردی لووس و ڕێک کە لە جێ مووزاییـک لە تەختی بەرهێوان فەرش دەکرێ ◄ ١. نعـره ٢. سنگ صاف ویژەی سنگفرش

**هەلانـدن / helandin/**: چـاوگ. ١. تواندنـــەوە؛ تاواندنەوە ٢. هلاندن؛ بڵند کردن ◄ ١. گُداختن ٢. بلند کردن

**هەلانـدی / helandî/**: ئاوەڵـناو. تـــواوە؛ تـــاواوە ◄ گُداختە

**هەلانن / helanin/**: ☜ هەلانین

**هەلانین / helanîn/**: چاوگ. هەلانن: ١. هەڵگرتن ٢. شاردنەوە ٣. دەرهێنان ‹دژمن هـەموو مادەنـێ مە هەلانین و بـرن› ٤. بڵـند/ بـەرزەوە کـردن ٥. لابردن؛ وەلا نان ◄ ١. برداشتن ٢. پنهان کـردن ٣. استخراج کردن ٤. بلند کردن ٥. کنار زدن

**هەلاو / helaw/**: ناو. ١. شـیرنی؛ شیرنایی؛ شیرانی ٢. گیایـەکی دەشـتییە ٣. ☜ هـالاو ٤. ☜ هەڵوا ٥. دۆشاو ◄ ١. شیرینی ٢. گیاهی صحرایی ٣. ☜ هالاو ٤. ☜ هەڵوا ٥. شیرەی انگور

**هەلاواربی / helawarbî/**: ناو. ١. هەلاوی؛ هەڵوای ئارد و دۆشـاو ٢. هەڵـوای ئـارد و شـەکراو ◄ ١. حلوای آرد و شیره ٢. حلوای آرد و شکر

**هەلاواوشک / helawawişk/**: ناو. وشکەڵوا؛ هەڵوای وشک ◄ حلوای خشک

**هـەلاون / helawin/**: نـاو. شـیرن وەک هەڵـوا ◄ شیرین مانند حلوا

**هـەلاوە / helawe/**: نـاو. گیایەکـە دەخـورێ ◄ گیاهی خوراکی

**هەلاوەمەلاوە / helawemelawe/**: سارستە. وتـەی منالان لە ئێوارەی نەورۆزدا کە بۆ گرتنی جێژنانە دەچنە سەر ڕۆچنی مالان ‹هەلاوەمەلاوە، کورتـان ببێ بە زاوا «بەیتی مندالان»› ◄ عبارتی کە کودکان شب عید نوروز برای دریافت عیدی می‌گویند

**هەلاوی / helawî/**: ناو. هەلاواربی؛ هەڵوای ئـارد و دۆشاو ◄ حلوای آرد و شیره

**هەلاهـەل / helahel/**: نـاو. هـەلاهیل؛ هەلایهـەل؛ هەلایل؛ گیاژار: ١. بنـە گیایـەکی یـەکسـالانی ژەحری لە تیرەی هەلالەیە بە گوڵی ورد و لقـی هلۆلەوە، لە پەنا چۆم و شوێنی شێدار دەڕوێ ٢. شیلەی ئەو گیایە کە ژارێکـی زۆر کوشـندەیە ◄ ١و٢. هلاهل

**هەلاهەلا[١] / helahela/**: ناو. هـەرا و هوریـا؛ هەڵـلا هەڵلا ◄ جار و جنجال

**هەلا ـ هەلا[٢]**: ئاوەڵناو. شەقار ـ شـەقار؛ لەبەریـەک چوو ◄ له و از هم پاشیده

**هەلاهیل / helahîl/**: ☜ هەلاهەل

**هەلای / helay/**: ناو. سەما؛ ڕەخس ☰ رقص

**هەلایل / helayil/**: ☜ هەلاهەل

**هەلایەری / helayerî/**: ناو. پاش نیوەڕۆ ☰ بعدازظهر

**هەلایهەل / helayhel/**: ☜ هەلاهەل

**هەلبا / helba/**: ☜ هەلوا

**هەلباسک / helbas(i)k/**: ناوەلناو. ئاوقا؛ بەرەنگار ☰ گلاویز

**هەلبسم / helbism/**: ☜ هەورێشم

**هەلبشکوڕین / helbişkûřîn/**: چاوگ. گەش و ڕووخۆش بوون ☰ شاد و سرحال بودن

**هەلبگێراندن / helbigêřandin/**: چاوگ. هەلبگێڕانن؛ هەلبگاردن: ١. بوداردن؛ خۆ لێ لادان ٢. داو دە نێو ڕاکردن ☰ ١. اعتنا نکردن ٢. تار و نخ از چیزی گذراندن

**هەلبگێڕانن / helbigêřanin/**: ☜ هەلبگێراندن

**هەلبلە / helb(i)le/**: ناو. بنە گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ ☰ ریشەی گیاهی دارویی

**هەلبوی / helbûy/**: ناو. بۆسۆ؛ بۆنی پەڕوی سووتاو ☰ بوی پنبه یا پارچەی سوخته

**هەلپەرست / helperist/**: ناوەلناو. هەلخواز؛ کەیسۆ؛ حیزفرسەت ☰ فُرصت‌طلب

**هەلپەرەست / helperest/**: ناوەلناو. [پلار] خۆڕێکخەر؛ بە هەموو بارێکدا هاوساز ☰ فُرصت‌طلب

**هەلپەز / helpez/**: ناو. منالدان؛ تۆلدان ☰ رَحِم

**هەلجاندن / helcandin/**: چاوگ. پەڕە کردن؛ شی کردنەوە بە هەلاجی ☰ حلاجی کردن

**هەلخواز / helx(i)waz/**: ☜ هەلپەرست

**هەلخۆش / helxoş/**: ناوەلناو. باوخۆش؛ خۆشباو ☰ خوش‌دست

**هەلژیویان / heljîwyan/**: چاوگ. فلیقانەوە؛ تلێقانەوە ☰ له شدن

**هەلساندن / helsandin/**: چاوگ. ١. شل و سست کردن ٢. کوتاندن ورد کردن (وەک: بۆ گەنم) ٣. لاواز کردن ٤. کەم کردنەوە ٥. ڕزاندن ٦. خراپ کردن؛ لە کار خستن ☰ ١. سُست کردن ٢. کوبیدن ٣. لاغر کردن ۴. کاستن ۵. پوساندن ۶ از کار انداختن

**هەلشتن / helîştin/**: چاوگ. ١. هشتن؛ ڕاگرتن ٢. بەجێ هێشتن ☰ ١. نگهداشتن ٢. به جا گذاشتن

**هەلفانەک[١] / helfanek/**: ناو. کاری پەل کوتانی بە ناچاری ☰ عمل دست و پا زدن از روی ناچاری

**هەلفانەک[٢]**: ناوەلکار. بە هەلکەوت؛ بێ چاوەنۆڕی ☰ اتفاقی

**هەلفۆ / helfo/**: ناوەلناو. [پلار] ١. گەلحۆ؛ قەلەوی تەمەل ٢. هەمەکارەی بێکارە ☰ ١. چاق تنبل ٢. همه‌کارەی هیچ‌کاره

**هەلفۆنە / helfone/**: ناو. سەیران و گەشت وێرای خواردن و خواردنەوە لە دەشت ☰ پیک‌نیک

**هەلقەلک / helqelik/**: ☜ هەلکەلك

**هەلک / helik/**: ناو. تیز؛ ڕشخەن؛ تیتالی؛ کاری گاڵتە کردن بە کەسێ ☰ ریشخند

**هەلکرن / helk(i)rin/**: چاوگ. ١. پێ کردن؛ داگرساندن ٢. دنە دان؛ هان دان ٣. توانەوە؛ تاوانەوە ☰ ١. افروختن ٢. برانگیختن ٣. ذوب‌شدن

**هەلکری / helk(i)rî/**: ناوەلناو. ١. پێ کراو؛ داگرساو ٢. دنە دراو؛ هان دراو ٣. تواوە؛ تاویاگەوە ☰ ١. افروخته ٢. برانگیخته ٣. ذوب‌شده

**هەلکە / helke/**: ناو. دۆلچە؛ سەتڵی چەرم ☰ دلو

**هەلکەتن / helketin/**: چاوگ. ١. مانەوە لە شوێنی خۆ ٢. بەرز بوونەوە و بەرە ژوور چوون ☰ ١. در جای خود ماندن ٢. اوج گرفتن

**هەلکەهەلک / helke helik/**: ناو. هەلقەلک؛ هەلک‌هەلک: ١. هانکەهانک؛ هەنکەهەنک؛ هەناسەبڕکێ لە ماندوویی و لە نەخۆشی ٢.

هانکەهانکی سەگی ماندوو ☰ ١. تنگی نفس از خستگی یا بیماری ٢. هِن‌هِن سگ خسته

**هەلکهەلک** / helik helik/: ☜ **هەلکەلك**

**هەللاج** / hellac/: ناو. هەلاج؛ لووپژەن ☰ حلاج

**هەللامە** / hellame/: ناو. هەلامە؛ هەلاو ☰ گیاهی وحشی و خوراکی

**هەللە** / helle/: ناو. ١. ڕەت؛ خلیسک ٢. هەڵە؛ خەتا ٣. هەرلە؛ خلێرە؛ داپیرۆشک ☰ ١. لغزش ٢. خطا ٣. خرخاکی

**هەللەق . مەللەق** / helleq melleq/: ☜ **حەلەق‌ـمەلەق**

**هەلم** / hel(i)m/: ناو. ١. دۆخی هەناسە دانەوە ٢. بۆ؛ بۆن ☰ ١. بازدم ٢. بو

**هەلمەلوک** / helmelûk/: ☜ **هەلهەلوک**

**هەلمەلە** / helmele/: ناو. چەقە و هەرا؛ گیرە و نیرە ☰ جنجال و غوغا

**هەلنایا** / helnaya/: ناوەلناو. تواوە؛ تاویاگەوە ☰ ذوب‌شده

**هەلنایش** / helnayîş/: چاوگ. تواندنەوە؛ تاواندنەوە ☰ ذوب کردن

**هەلنگافتن** / helingaftin/: چاوگ. هەلنگفتن؛ ڕەت بردن؛ سەرەنگرێ بوون ☰ سکندری خوردن

**هەلنگفتن** / helingiftin/: ☜ **هەلنگافتن**

**هەلوربلور** / helurbilur/: ☜ **هەتۆلمەتۆل**

**هەلون** / helun/: ☜ **هەلوکێن**

**هەلوەلا** / helwela/: ناو. هات‌وچۆ و ماندوویی زۆر لە شوێن کارێک ‹بۆ دەست خستنی کارێک کەوتۆتە هەلوەلا› ☰ تکاپوی بسیار

**هەلویرک** / helwîrik/: ☜ **هەلۆرك**

**هەلوێشکی** / helwêşkî/: ناوەلکار. لەوەتا؛ لەوساوە ☰ از آن هنگام

**هەلۆ**[١] / helo/: ناو. هەلەو؛ شوان‌خەلەتێنە ☰ شبان‌فریبک

**هەلۆ**[٢]: ☜ **هلو**

**هەلۆرک** / helorik/: ناو. هەلۆرکە؛ هەلویرک؛ هەلیلگ؛ هەلووکی؛ هەلوورک؛ هەلوولک؛ هەلوولکی؛ هەلۆلگ؛ هەلۆک؛ مەیلۆ؛ مێلۆ؛ جۆلانەی تێدا نووستنی زارۆک و نەخۆش ☰ ننو

**هەلۆرکە** / helorke/: ناو. ١. جۆلانەی گوریس ٢. ☜ هەلۆرك ☰ ١. تاب ٢. ☜ **هەلۆرك**

**هەلوربلور** / helûrb(i)lûr/: ☜ **هەتۆلمەتۆل**

**هەلورک** / helûrik/: ☜ **هەلۆرك**

**هەلورکە** / helûrke/: ناو. جۆرێ هەلپەڕکێی کیژۆلان ☰ نوعی رقص دخترکان

**هەلوک** / helûk/: ناو. ١. لەتی پچووک لە دوو داری هەلووکان ٢. داری دارەڕای خانوو ☰ ١. چوب کوچکتر الک‌دولک ٢. دیرک خانه

**هەلوکان** / helûkan/: ☜ **هەلوکێن**

**هەلوکانی** / hęlûkanî/: ☜ **هەلوکێن**

**هەلوکێن** / helûkên/: ناو. هەلووکان؛ هەلەرە؛ هلوو؛ هەلووکانی؛ چۆحەلێن؛ حەللوو؛ هەلون؛ چوحەلین؛ ترانێ؛ ئەلگمەلگ؛ گەمەیەکی زارۆکانە، بە دارێکی درێژ (دارهەلووک) لە دارێکی بچووک (هەلووک) دەدەن ☰ بازی الک‌دولک

**هەلولک** / helûlik/: ☜ **هەلۆرك**

**هەلولکی** / helûl(i)kî/: ☜ **هەلۆرك**

**هەلونە** / helûne/: ناو. گلیەر؛ گیراز؛ بلالووکەکێویلە ☰ آلبالوی کوهی

**هەلە**[١] / hele/: ناو. ١. وتەی خۆش و بێشی ٢. هەل؛ تاو؛ دەم ٣. هەڵە؛ خەتا ٤. گوڵێکی جوانە، سوور و زەرد و ڕەشی هەیە ☰ ١. کلمەی خوشامدگویی ٢. دم؛ وقت ٣. سهو ۴. از گُل‌ها

**هەلە**[٢]: ناوەلکار. ١. هێشتا؛ تاوێستاش؛ هەتا ئێستاش ٢. کە وابوو ٣. بەتایبەت ☰ ١. تاکنون ٢. پس ٣. بویژه

**هەلەبەل** / helebel/: ناو. ١. هەرا و هوریا و زەنا ـ

زەنا ٢. دڵخورتی و پەرێشانی ☰ ١. جار و جنجال ٢. اضطراب

**هەڵەرە / helere/**: ☜ **هەڵوکێن**

**هەڵەڕەش / heleřeş/**: ناو. گوڵی هەڵەی ڕەش ☰ گلی است

**هەڵەز / helez/**: ناو. هەڵز؛ گیایەکی گەڵا دەرزییە ☰ گیاهی است

**هەڵەزەر / helezer/**: ناو. گوڵی هەڵەی زەرد ☰ گلی است

**هەڵەسۆر / helesor/**: ناو. گوڵی هەڵەی سوور ☰ گلی است

**هەڵەسیایا / heles(i)yaya/**: ناوەڵناو. ١. گەنیوی بۆن‌گرتوو ٢. *[کنایە]* قەڵەوی تەمەڵ ☰ ١. گندیدەی بوگرفته ٢. فربه تنبل

**هەڵەفە / helefe/**: ناو. قوڵفە؛ قوڵفەی گوریس ☰ حلقەی رسن

**هەڵەق ـ مەڵەق / heleq meleq/**: ☜ حەڵەق ـ مەڵەق

**هەڵەقە مەڵەقە / heleqemeleqe/**: ناو. حیندرحۆ؛ سیسۆ؛ هەڵلادۆشە؛ ئەمسەرـ ئەوسەر ☰ آلاکلنگ

**هەڵەک[1] / helek/**: ناو. ١. ئاڵقە ٢. نیوجەغز ☰ ١. حلقه ٢. نیم‌دایره

**هەڵەک[2]**: ناوەڵناو. ١. خوار؛ لار ٢. زڕ ‹کورە هەڵەک› ☰ ١. کج ٢. ناتنی

**هەڵەکا / heleka/**: ناو. هەڵەکە؛ هەڵەکەسەما؛ جەزمە؛ حاڵی تایبەتی دەروێشان لە کاتی زیکر و سەمادا ☰ جذبه

**هەڵەکە / heleke/**: ☜ **هەڵەکا**

**هەڵەکەت / heleket/**: ☜ **حەرەکەت**

**هەڵەکەسەما / helekesema/**: ناو. ١. هێلکەسەما؛ مشک‌گرە ٢. ☜ **هەڵەکا** ☰ ١. تُرمتای ٢. ☜ **هەڵەکا**

**هەڵەلە / helele/**: ناو. ١. بالۆرەی گەروو ٢. حەڵەلا؛ کاری سەگ تێبەردان ☰ ١. هلهله ٢. تحریک سگ

**هەڵەم / helem/**: ناوەڵناو. زۆر بەرز و سەخت؛ هەڵەمووت؛ ئەڵەمووت؛ هەزاربەهەزار ☰ بُلند و دشوارگُذر

**هەڵەمار / helemar/**: ناو. ١. پەلامار؛ شالاو ٢. ژیلەمۆ؛ بووڵ ☰ ١. حمله ٢. خاکستر گرم

**هەڵەمتە / helemte/**: ناوەڵناو. هەوانتە؛ خۆڕایی؛ مفت ☰ مُفت

**هەڵەمتەچی / helemteçî/**: ناوەڵناو. *[پلار]* ١. مفتەخۆر؛ بەلاشخۆر؛ لامژ ٢. شەلاتی؛ دەسبڕ؛ ساختەچی ☰ ١. مُفتخور ٢. شارلاتان

**هەڵەو[1] / helew/**: ☜ **هەڵۆ[1]**

**هەڵەو[2]**: ☜ **هلو**

**هەڵهسوون / helhisûn/**: چاوگ. ١. ساوین؛ پیامالین ٢. ئەسترین؛ سڕین ☰ ١. اندودن ٢. سُتُردن

**هەڵهلی / helh(i)lî/**: ناوەڵناو. ١. بڵ و زۆر گەیشتوو ٢. پیری تەواو کەنەفت ☰ ١. رسیدەی نرم شده ٢. پیر فرتوت

**هەڵهلین / helh(i)lîn/**: چاوگ. ١. بڵ بوون و زۆر گەیشتن (میوە) ٢. لە پیریان لە تاقەت کەوتن؛ زورهان بوون ☰ ١. آب‌لنبو شدن (میوە) ٢. پیر شدن و ازکار افتادن

**هەڵهەلاک / helhelak/**: ☜ **هەلالك**

**هەڵهەلۆک / helhelok/**: ☜ **هەلالك**

**هەڵهەلووک / helhelûk/**: ناو. هەڵمەلووک؛ بلالووک؛ برالووک؛ بەلالووک ☰ آلبالو

**هەڵهەلە[1] / helhele/**: ناو. ١. هەڵەلە؛ بالۆرە بە گەروو ‹ئەوی ئەمڕۆ بە دەوری تەختیایە هەڵهەلەی مەخلووق/ لە دەوری نەعشیا سبحەی دەبینی وەلوەلەی مەخلووق «مەحوی»› ٢. بۆنی ناخۆش

☰ ١. هلهلەی شادی ٢. بوی بد

**هەڵهەلە**[٢]: ئاوەڵناو. خراپ؛ نەشیاو ☰ ناپسند

**هەلی**[١] / helî/: ئاوەڵناو. حەلی؛ زڕ ‹کوڕ هەلی› ☰ ناتنی

**هەلی**[٢]: ئاوەڵکار. تاوێک؛ ساتێ؛ دەمووکەیەک ☰ دمی؛ لختی

**هەلیان** / helyan/: چاوگ. ١. توانەوە؛ تاویانەوە ٢. هەڵاتن لە شەڕدا ‹زیخ بە نەهەلێ› ☰ ١. ذوب شدن ٢. فرار کردن در جنگ

**هەلیز** / helîz/: ناو. کا؛ پووش ☰ کاه؛ خس

**هەلیسکان** / helîskan/: چاوگ. خلیسکان؛ خزیان ☰ لغزیدن

**هەلیسە** / helîse/: ناو. ١. ☜ هەریسە ٢. پڵاوی ساوار ☰ ١. ☜ هەریسە ٢. پلو بلغور

**هەلیکوپتەر** / helîkupter/: ☜ هیلیکۆپتەر

**هەلیل** / helîl/: ناو. هەریر؛ جۆرێ هەڵوایە لە دۆشاوی وشکەوە بوو ☰ نوعی حلوا

**هەلیلگ** / helîlig/: ☜ هەلۆرك

**هەلیلە** / helîle/: ناو. بەری دارێکە لە هیندووستان، ڕەش و زەردی هەیە و بۆ دەرمان دەشێ ☰ هلیله

**هەلیم** / helîm/: ناو. حەلیم ☰ حلیم

**هەلیماو** / helîmaw/: ناو. شۆربای برنج، بێ ڕۆن ☰ سوپ برنج بدون روغن

**هەلین** / helîn/: چاوگ. توانەوە؛ تاویانەوە ‹بهارێ بەفر دهەلێ› ☰ ذوب شدن

**هەلینایش** / helînayîş/: چاوگ. تواندنەوە؛ تاواندنەوە ☰ ذوب کردن

**هەلینگ** / helîng/: ناو. ١. غار؛ ڕا؛ هەرا ٢. دەلینگی دەرپێ ☰ ١. دو ٢. پاچەی شلوار

▣ **هەلینگ دان**: ڕاکردن؛ غار دان ‹هەلینگ دە برۆ!› ☰ دویدن

**هەلینگدەر** / helîngder/: ناو. سوارە؛ کەسێ کە ئەسب غار دەدا ☰ سوارکار

**هەلیە** / helye/: ئاوەڵکار. ١. کەمێک؛ چکێ؛ نەختێ ٢. لە سووچێکەوە ☰ ١. اندکی ٢. از گوشەای

**هەلێ** / helê/: ☜ هەلێك

**هەلێب** / helêb/: ئاوەڵناو. حەلیب؛ دروست؛ ڕەوا ☰ جایز؛ روا

**هەلێر** / helêr/: ناو. ناوەند؛ چەق ☰ مرکز

**هەلێک** / helêk/: ئاوەڵکار. هەلێ؛ گەرانگە؛ جارێک؛ چەلێک ☰ یک بار

• **هەلێن** / helên-/: پاشوشە. ـ هەڵدەوە؛ ـ لاگرە ‹چارێ‌هەلێن؛ پەرداهەلێن› ☰ بالازن

**هەڵ**[١] / heł/: ناو. ئاغەڵ؛ هۆلەمەڕ؛ گەوڕ ☰ آغُل

**هەڵ**[٢]: ئاوەڵناو. ١. پێ؛ داگیرساو ٢. پەل؛ لاپەڕ ☰ ١. روشن ٢. جُدا

**هەڵ** •[٣]: پێشگر. ئەڵ-: ١. بۆ سەر؛ بەرەو ژوور ‹هەڵدان؛ هەلکشان؛ هەڵهێنان› ٢. وەرێ بەرەوخۆ ‹هەڵگرتن› ٣. سوور؛ خول؛ پێچ؛ دەور؛ گەڕ ‹هەڵگەڕان؛ هەڵسووڕان› ٤. لە پێش ڕەگی کارەوە، ئاوەڵناو دروست دەکا ‹هەڵگر؛ هەڵخەر› ٥. لە پێش ڕەگی کارەوە، ناو دروست دەکا ‹هەڵکرد› ☰ ١. بالا ٢. بر- ٣. ـ گرد ۴. صفت‌ساز ۵. اسم ساز

• **هەڵئاخن** / heł'axin/: ☜ - هەڵاخن

**هەڵئاخنین** / heł'axinîn/: چاوگ. هەڵاخنین؛ هەڵازنین؛ تا سەر ئاخنینەوە ☰ تا لبه آکندن

**هەڵئاوسان** / heł'aw(i)san/: چاوگ. هەڵاوسان؛ هەڵواسان ☰ آویزان شدن

**هەڵئاوەسین** / heł'awesîn/: چاوگ. هەڵاووسین؛ هەڵواسین؛ بەرەو ژوور دالەقاندن ☰ آویزان کردن

**هەڵا** / heła/: ناو. ١. زەنازەنا؛ هەرا و چەقە ‹ناو کۆلان بوو بە هەڵا› ٢. کێشە و شەڕ ‹لەو هەڵایەدا دەکەس کوژرا› ٣. دنیای بێ‌خۆر ‹هەور و هەڵایە›

٤. ئاموور؛ هەوجار 🇮🇷 ١. همهمه ٢. نـزاع ٣. هـوای ابری ۴. خیش

◘ **هەڵا بردن**: هێرش بردنە سەر 🇮🇷 هجوم بردن

**ـ هەڵات** / -heɫat/: پاشەوشە. ــ خێـز؛ بـەرزەوەبوو ‹ڕۆژهەڵات؛ تاوهەڵات› 🇮🇷 بالا آمده؛ بردمیده

**هەڵاتگ** / heɫatig/: ☜ **هەڵاتوو**[1]

**هەڵاتن** / heɫatin/: چاوگ. هەڵهاتن: ١. ڕاکـردن؛ دەرچوون ‹ئەم قافییەت بە چەشنی دڵی مـوددەعی حەسەن!/ تەنگە، درەنگە، مەیلی بە جەنگـە، هەڵـێ! مەڵێ! «سەیفولقوزات»› ٢. لە ئاسۆوە دەرکـەوتنی مانگ و خۆر و ئەستێرە ‹کەی بـێ کـە لـە ئـوفقی عەرەبســتانەوە ڕۆژێ/ هەڵــبێ گوڵــی خورشــیدی درەخشانی کووەیتم؟ «بێخود»› ٣. پەڕینی نێر لـە مێوینە ‹ئەسپەکە دوو جار لە ماینەکـە هـەڵات› ٤. پێگەیشتنی هـەویر ‹هـەر هەویرەکـە هـەڵات نـان ئەکەین› ٥. تەواو بوون؛ بە سـەر چـوون؛ بڕانـەوە ‹هەرگا عیددەت هەڵات دەتوانی مێـرد بکـەی!› ٦. خۆ لە ناو ئاودا قوم کردن و هاتنەوە دەر ‹بـەیانی زوو دە حەوزێ هەڵاتم› 🇮🇷 ١. فـرار کـردن ٢. طلـوع کردن ٣. سوار شدن گشن بر مادینه ۴. برآمدن خمیـر ۵. سر آمدن مُدت ۶. غوطەور شدن در آب

**هەڵاتنەوە** / heɫat(i)newe/: چـاوگ. هەڵکەنران و شــکانی دەســکی دەفــر (گــۆزە و کتــری و ...) ‹دەسکی کترییەکە هەڵاتۆتەوە› 🇮🇷 شکستن دستەی ظرف

**هەڵاتوو**[1] / heɫatû/: ناوەڵناو. هـەڵاتگ؛ هەڵـهاتگ؛ هەڵاتە: ١. قوشقی ٢. سەرکەوتە ٣. کۆتایی پـێ هاتوو ٤. ڕاکردوو؛ دەرچوو؛ واینی ‹سێ زینـدانیی هەڵاتوو دەستگیر کـران› 🇮🇷 ١. رمیـده ٢. برآمـده ٣. سرآمده ۴. فراری

**ـ هەڵاتوو**[2]: پاشەوشە. ـ هەڵگەڕاو ‹وشکهەڵاتوو› 🇮🇷 ـ زده؛ برآمده

**هەڵاتە** / heɫate/: ☜ **هەڵاتوو**[1]

**هەڵات ـ هەڵات** / heɫat heɫat/: نـاو. کـار و ڕەوتی ڕاکردن بە گشتی؛ هەڵاتنی هەموو کەس لە کاتی مەترسیدا ‹لەو هەڵات ـ هەڵاتەدا زۆر کەس کەوتنـە ژێر پێیان و گیانیان لە دەست دا› 🇮🇷 فرار عمومی

**هەڵاچۆ** / heɫaço/: ناوەڵناو. هەڵچۆ؛ تووڕە؛ گـرژ 🇮🇷 خشمگین

**هەڵاچوون** / heɫaçûn/: چاوگ. لـە بڵـندی چوونـە سەر 🇮🇷 صعود کردن

**ـ هـەڵاخـن** / -heɫaxin/: پاشەوشـە. ـ هەڵــئاخن؛ تێتەپێن 🇮🇷 ـ آکند

**هەڵاخنان** / heɫax(i)nan/: ☜ **هەڵاخنران**

**هەڵاخناو** / heɫax(i)naw/: ☜ **هەڵاخنراو**

**هەڵاخندران** / heɫaxind(i)ran/: ☜ **هەڵاخنران**

**هەڵاخندراو** / heɫaxind(i)raw/: ☜ **هەڵاخنراو**

**هـەڵاخنـران** / heɫaxinran/: چـاوگ. هــەڵاخنان؛ هەڵاخندران؛ بە نهێم تا لێوان پڕ بوونەوە 🇮🇷 آکنده شدن

**هـەڵاخنـراو** / heɫaxinraw/: ناوەڵـناو. هــەڵاخناو؛ هەڵاخندراو؛ هەڵاخنیاگ؛ ئاخندراو تـا لێـوان بـە پتەوی 🇮🇷 آکنده تا لبه با فشار

**هەڵاخنیاگ** / heɫaxinyag/: ☜ **هەڵاخنراو**

**هەڵاخنین** / heɫax(i)nîn/: ☜ **هەڵئاخنین**

**هــەڵازڕان** / heɫaz(i)řan/: چــاوگ. هەڵــــزڕان؛ هەڵزڕیان؛ خوێن تێ تزان 🇮🇷 خونمُرده شدن

**هەڵازنان** / heɫaz(i)nan/: چاوگ. هەڵازندران: ١. هەڵاخنران ٢. گش لای لـەش (پێسـت) وە بـەر هاتن 🇮🇷 ١. آکنده شدن ٢. تمام پوسـت را (جـوش یـا کهیر) گرفتن

**هەڵازناو** / heɫaz(i)naw/: ناوەڵناو. هەڵازنـدراو: ١. هەڵاخناو ٢. گش لای پێست وەبەر هاتوو ‹بـۆقی پنۆکپنۆکی هەڵازناو› 🇮🇷 ١. آکنده تا لبه بـا فشـار ٢. فرا گرفتگی تمام پوست (از جوش یا کهیر)

**هەڵازندران** / heɫazind(i)ran/: ☜ **هەڵازنان**

**هەڵازندراو** / hełazind(i)raw/: ☜ **هەڵازناو**

**هەڵازنین** / hełaz(i)nîn/: چاوگ. ١. ☜ **هەڵناخنین** ٢. گش لای پێست وەبەر هاتن ٣. خەونووچکە بردنەوە ☰ ١. ☜ **هەڵناخنین** ٢. همەی پوست را (جوش یا کهیر) فرا گرفتن ٣. چُرت زدن

**هەڵاژان** / hełajan/: ☜ **هەڵاژیان**

**هەڵاژاندن** / hełajandin/: چاوگ. ڕاکێشان ☰ خواباندن

**هەڵاژیاگ** / hełaj(i)yag/: ناوەڵناو. هەڵاژیاو؛ ڕاکشاو ☰ درازکشیده

**هەڵاژیان** / hełaj(i)yan/: چاوگ. هەڵاژان؛ هەڵاژین؛ ڕاکشان؛ خۆ درێژ کردن بۆ خەوتن ☰ دراز کشیدن

**هەڵاژیاو** / hełaj(i)yaw/: ☜ **هەڵاژیاگ**

**هەڵاژین** / hełajîn/: ☜ **هەڵاژیان**

**هەڵاش** / hęłaş/: ناو. ئالاش؛ هالاش؛ هەراش ☰ انبیره

**هەڵافە** / hełafe/: ناو. چەکەرەی گیا ☰ نیش گیاه

**هەڵاڤی** / hełavî/: ناو. گیایەکە بۆ مالات ژەهرە ☰ گیاهی که دام را مسموم می‌کند

**هەڵاڵ**[1] / hełał/: ناو. ١. ☜ **هەڵاڵە** ٢. *[مەجاز]* حەلاڵ؛ حەرەم؛ ژنی ڕەوا و شەرعی ‹هەلال خۆمە› ٣. هەڵاڵە؛ دەرمانی پێستە خۆش کردن، کە بۆنێکی ناخۆشی هەیە ‹لە حاندی بۆنی بەیبوون و هەلالە/ عەبیر و میشکی چین، مەشکەی هەلالە «حەقیقی»› ☰ ١. ☜ **هەڵاڵە** ٢. زن شرعی ٣. داروی دباغی

▣ **هەڵاڵ دان**: خۆش کردنی چەرم بە دەرمان ☰ دباغی کردن

**هەڵاڵ**[2]: ☜ **حەلاڵ**

**هەڵاڵچی** / hełałçî/: ناو. دەواخ؛ دەواغ ☰ دبّاغ

**هەڵاڵخانە** / hełałxane/: ناو. دەباغخانە؛ ئەو شوێنەی چەرمی لێ خۆش دەکەن ☰ دباغ‌خانه

**هەڵاڵە** / hełałe/: ناو. هەلاڵ؛ هەراله: ١. گوڵێکی زەردی بۆنخۆشە ٢. هەلاڵ؛ دەرمانی پێستە خۆش کردن ٣. ماکی مۆم کە میشەنگوین لە گوڵانی دەگرێ ٤. گەردەی ڕوەکی نێر بۆ ئاوس بوونی ڕوەکی مێوینە ٥. جاڕ؛ هەرای بە قەو ٦. مێلاقە؛ ڕەبەنۆک ☰ ١. گلی زرد و خوشبو ٢. داروی دباغی ٣. مادەی موم که زنبور از گلها می‌گیرد ۴. گردەی گل ۵. بانگ؛ جار ۶. آلاله

▣ **هەڵاڵەی شتێ کردن**: ڕاگەیاندنی فرۆشتنی شتێک ‹هەلاڵەی سێو دەکەن بزا ئەگەر باشە، هێندێک بسێنە!› ☰ فروش چیزی را جار زدن

**هەڵاڵەبرایمە** / hełałeb(i)rayme/: ☜ **هەڵاڵەبرمە**

**هەڵاڵەبرم ـ برم** / hełałeb(i)rm b(i)rm/: ☜ **هەڵاڵەبرمە**

**هەڵاڵەبرمە** / hełałebirme/: ناو. هەلاڵەبرایمە؛ هەلالەبرم ـ برم؛ شلێرە؛ چەشنێ گوڵی لالەی سوور یان زەردی گەورە و هەڵگەڕاوەیە ☰ لالەی واژگون

**هەڵاڵەپژێ** / hełałpiȓjê/: ناو. گەردەپژێنی؛ گەردەشانی؛ بڵاوەی گەردە، لە ئەندامی زاوزێی نێرەوە بۆ ئەندامی زاوزێی مێ، بە شێوەی ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ (بە هۆی با، ئاو و مێروو) ☰ گردەافشانی

**هەڵاڵەکشکش** / hełałekişkiş/: ناو. چۆپی؛ جۆرێ سەما و ڕەخس ☰ نوعی رقص

**هەڵاڵەکەر** / hełałeker/: ناو. قارقارۆک؛ جارکێش؛ کەسێ کە بۆ شت فرۆشتن هەرا دەکا ☰ جارچی

**هەڵاڵەوزمزم** / hełałewzemzem/: ناو. ترێ‌مارانە؛ ڕەزڕەزۆک ☰ تاجریزی

**هەڵامات** / hełamat/: ناو. ١. نیشانە؛ عەلامەت ٢. ☜ **هەڵامەت** ٣. ☜ **هەڵمەت ـ١** ☰ ١. علامت

۲. ☜ هەلامەت ۳. ☜ هەڵمەت ـ۱

**هەلاماسین** / /hełamasîn/: ☜ هەڵماسین

**هەلامسان** / /hełam(i)san/: ☜ هەڵماسین

**هەلامساندن** / /hełam(i)sandin/: ☜ هەڵمساندن

**هەلامساو** / /hełam(i)saw/: ☜ هەڵماسیو

**هەلامسین** / /hełam(i)sîn/: ☜ هەڵماسین

**هەلامسیو** / /hełam(i)sîw/: ☜ هەڵماسیو

**هەلامەت** / /hełamet/: ناو. ئالامات؛ ئالامەت؛ ئەلامەت؛ هالمەوت؛ هەلامات؛ ئارسم؛ پەسیف ≣ زُکام

**هەلامەتدار** / /hełametdar/: ئاوەڵناو. ۱. نیشانە لێ دراو ۲. کەسێ کە پەسیوی بێت ≣ ۱. نشان شده ۲. زُکامی

**هەلامەتگرتو** / /hełametgirtû/: ئاوەڵناو. مرکی؛ پەسیفداری ≣ مبتلا به زُکام

**هەلان** / /hełan/: چاوگ. (!) هەڵدان؛ هەڵخستن؛ بەرزکردنەوە ‹هەوری بەهاری کردی بە هەلا/ گولالە خەیمەی ئالی خۆی هەلا «پیرەمێرد»› ≣ برپا کردن

**هەلاو** / /heław/: ☜ هالاو

**هەلاوارتن** / /heławartin/: چاوگ. هەلاواردن؛ ئاوارتن؛ جیاوەکردن ≣ مُتمایز کردن

**هەلاواردن** / /heławardin/: چاوگ. ۱. لێک جیا کردنەوە ۲. ناسینەوە؛ پێزانین ≣ ۱. از هم جدا کردن ۲. تشخیص دادن

**هەلاواستن** / /heławastin/: ☜ هەڵواسین

**هەلاواسین** / /heławasîn/: ☜ هەڵواسین

**هەلاوردن** / /heławirdin/: چاوگ. ۱. هەڵهاوردن؛ ڕشانەوە؛ هاوردنەوەی خۆراک ۲. هێلکە کردنە جووچکە ‹مامرەکە چوار جووجەڵەی هەلاورد› ۳. دۆزینەوەی جواوی مەتەڵۆکە ٤. سندان لێهاتنی مالات ≣ ۱. بالا آوردن ۲. تخم را جوجه کردن ۳. معما را حل کردن ۴. مُبتلا شدن دام به نوعی بیماری کشنده

**هەلاوردنەوە** / /heławird(i)newe/: چاوگ. ڕشانەوە؛ هاوردنەوەی خۆراک ≣ بالا آوردن .

**هەلاوردە** / /heławirde/: ناو. ۱. نەخۆشی سندانی مالات ۲. ئەوەی بە هۆی ڕشانەوە لە گەدە دەڕژێتە دەرەوە ≣ ۱. نوعی بیماری کشندەی دام ۲. استفراغ

**هەلاوسان** / /heław(i)san/: چاوگ. ۱. ☜ هەڵماسین ۲. هەڵواسران؛ دالەقان ≣ ۱. ☜ هەڵماسین ۲. آویزان شدن

**هەلاوساو** / /heław(i)saw/: ☜ هەڵماسیو

**هەلاوسین** / /heławsîn/: چاوگ. لەقاندن ≣ آویختن

**هەلاوە** / /heławe/: ناو. جاو؛ جانگ ≣ کرباس

**هەلاوەستن** / /heławestin/: ☜ هەڵواسین

**هەلاوەسران** / /heławesran/: ☜ هەڵواسران

**هەلاوەسراو** / /heławesraw/: ئاوەڵناو. هەڵواسراو؛ دالەقاو ≣ آویخته

**هەلاوەسین** / /heławesîn/: ☜ هەڵواسین

**هەلاوەگێڕ** / /heławegêř/: ئاوەڵناو. ژێروڕووکراو؛ ژێروبان کریاگ ≣ زیروروشده

**هەلاویتن** / /heławîtin/: ☜ هەلاویژتن

**هەلاویژتن** / /heławîjtin/: چاوگ. هلاویستن؛ هلاڤیتن؛ هەلاویتن؛ هەلاویشتن؛ هەڵهاویتن؛ هەڵهاویشتن؛ فڕێ دان بەرەو ژوور ≣ بالا انداختن

**هەلاویستن** / /heławîstin/: ☜ هەڵواسین

**هەلاویشتن** / /heławîştin/: ☜ هەلاویژتن

**هەلاوێر**[1] / /heławêr/: ناو. هاوێر؛ بەدەر؛ کار و ڕەوتی بە دەر کردنی یەک یان چەند ئەندامی نێو کۆمەڵەیەک، لە بڕیار یان کارێک ‹تکایە کەسی لێ هەلاوێر مەکەن!› ≣ استثنا

**هەلاوێر**[2]: ئاوەڵناو. لێک جیا کەرەوە ≣ از هم جدا کننده

**هەڵاوێران / heławêran/**: چاوگ. هەڵاواردن؛ لێک جیا کردنەوە ‹هەتا خودا پاک و پیس لێک هەڵاوێرێ و پیسەکان لە سەریەک دانێ و بە تێکڕایی کۆگاياندا و بیانخاتە دۆژەهەوە، هەر خۆیان زیانبار بووگن «هەژار، *قورئان*»› ⚑ از هم جدا کردن

**هەڵاوێز / heławêz/**: ناوەڵناو. هەڵاوەسراو؛ داڵەقاو ‹پەردەیەکی هەڵاوێز لە نێوان ئێمە و ئێوەدایە› ⚑ آویخته

**هەڵاوێژ / heławêj/**: ناوەڵناو. بەرەو ژووور فڕێدەر ⚑ بالا انداز

**هەڵایسان / hełay(i)san/**: چاوگ. ١. ئاگر گرتن؛ گڕ تێ بەر بوون؛ پێ بوون ‹وەکوو پەروانە بۆ شەمعی جەمالی تۆ حەریق ئەمشەو/ چرای شەوقی بە کبریتی تەبیعەت خۆش هەڵایساوە «حەریق»› ٢. */کینایە/* شەڕ و هەرا قەومان ⚑ ١. برافروخته شدن ٢. آشوب به پا شدن

**هەڵایساندن / hełay(i)sandin/**: چاوگ. هەڵاییساندن: ١. گڕ بەرز کردنی ئاگر ٢. */کینایە/* کێشە نانەوە ٣. */کینایە/* ئاگر تێبەر دان؛ زۆر توورە کردن ⚑ ١. آتش برافروختن ٢. مایەی شر و فتنە شدن ٣. به شدت عصبانی کردن

**هەڵاییساندن / hełayîsandin/**: ☜ **هەڵایساندن**

**هەڵبچڕین / hełbiçřîn/**: چاوگ. لە سەر فڕێ دان ‹ئەم سەرە قوتووە هەڵبچڕە!؛ مشەماکە لە برینەکەت هەڵبچڕە!› ⚑ برکندن

**هەڵبرژان / hełbirjan/**: چاوگ. هەڵبرژیان: ١. پێش هەڵاتن لە گەرمان ٢. برژانەوە و سووزانەوەی پێست ٣. هەتوان لە سەر دانان و برژاندنەوەی برین ⚑ ١. از گرما به ستوه آمدن ٢. سوزش در پوست احساس کردن ٣. بند آوردن خونریزی زخم و مرهم بر آن گذاشتن

**هەڵبرژیان / hełbirj(i)yan/**: ☜ **هەڵبرژان**

**هەڵبرنگان / hełb(i)ringan/**: ☜ **هەڵبرینگاندن**

**هەڵبرنگاندن / hełb(i)ringandin/**: ☜ **هەڵبرینگاندن**

**هەڵبرنگانن / hełb(i)ringanin/**: ☜ **هەڵبرینگاندن**

**هەڵبرینگان / hełb(i)rîngan/**: ☜ **هەڵبرینگاندن**

**هەڵبرینگاندن / hełb(i)rîngandin/**: چاوگ. هەڵبرنگان؛ هەڵبرنگاندن؛ هەڵبرینگان؛ هەڵبرینگانن؛ هەڵبورونگان؛ وەستانەوە؛ وشک بوون (باران) ‹هەوری ڕەش و چلکن بەربینگی عاسمانیان بەرنەدەدا. تەم لە سەران نەدەڕەوی و باران هەڵی نەدەبرینگاند «هێمن»› ⚑ بند آمدن (باران)

**هەڵبرینگانن / hełb(i)rînganin/**: چاوگ. هەڵبرینگاندن؛ وشک کردن (باران) ‹هەور هەڵینابرینگێنێ تاوێکی/ ئاوی چاوی جاری وەکوو جۆبارە «حەقیقی»› ⚑ بند آمدن (باران)

**هەڵبڕان / hełb(i)řan/**: چاوگ. هەڵبڕیان: ١. بڕدران؛ بڕیان (لە خوارەوە بۆ سەر) ٢. جوێ بوونەوە ‹کاکم لە ئێمە هەڵبڕا› ٣. بەرز کرانەوە؛ هەڵگیریان ‹کاکم لە ئێمە هەڵبڕا› ٤. لا بران ‹بەرگی ڕەش ئیتر لە بەرمان دادڕا/ بەندەگی و دیلی و ئەسارەت هەڵبڕا «هێمن»› ⚑ ١. بُریده شدن ٢. جدا شدن ٣. بُلند شدن (توسط دیگری) ۴. برداشته شدن

**هەڵبڕاندن / hełb(i)řandin/**: چاوگ. هەڵبڕانن؛ هەڵبڕین: ١. بلند کردن؛ لە زەوی بڕین ٢. بڕین؛ برینەوە؛ قەلت کردن ٣. کەوتنە شوێن بە غار ⚑ ١. بُلند کردن ٢. بُریدن با تیغ ٣. به دو تعقیب کردن

**هەڵبڕانن / hełb(i)řanin/**: ☜ **هەڵبڕاندن**

**هەڵبڕاو / hełb(i)řaw/**: ناوەڵناو. ١. بڕدراو؛ قەلت کراو ٢. ڕاکردوو لە ترسان ٣. جیاوەبوو ٤. بلندکراو؛ بەرزەوەکراو ⚑ ١. بُریده شده با تیغ ٢. فراری از ترس ٣. جُدا شده ۴. بُلند شده

**هەڵبڕ ـ دابڕ** / helbiř dabiř/: ☜ **هەڵبڕ ـ هەڵبڕ**

**هەڵبڕزکان** / helbiř(i)zkan/: ☜ **هەڵبزڕکان**

**هەڵبڕزکین** / helbiř(i)zkîn/: ☜ **هەڵبزڕکان**

**هەڵبڕسقان** / helbiř(i)sqan/: چاوگ. ڕفان؛ ڕفیان؛ فڕان 🇮🇷 ربوده شدن

**هەڵبڕسقانن** / helbiř(i)sqanin/: چاوگ. ڕفاندن؛ فڕاندن 🇮🇷 ربودن

**هەڵبڕسکان** / helbiř(i)skan/: ☜ **هەڵبزڕکان**

**هەڵبڕ ـ هەڵبڕ** / helbiř helbiř/: ئاوەڵناو. هەڵبڕ ـ دابڕ: ١. لەت ـ لەت؛ لەت و کوت کراو ٢. پەرژوبلاو؛ لێکبڕاو (کۆمەڵی زیندوو) ‹گورگ وەناو مەڕ کەوت هەڵبڕ ـ هەڵبڕی تێ خستن› 🇮🇷 ١. پارە ـ پارە ٢. پراکندە (جمعی زندە)

**هەڵبڕیان** / helbiřyan/: ☜ **هەڵبڕان**

**هەڵبڕین** / helb(i)řîn/: چاوگ. ١. هەڵوڕین؛ بەرزەو کردن؛ بڵند کردن ‹زەمانە بەعزە کەسانێ لەپڕ کە هەڵدەبڕێ/ ئەوەندی هەڵدەبڕێتن هەتا لە کەل دەبڕێ! «مەحوی»› ٢. هەڵوڕین؛ کەوتنە شوێن یەکێ بە غار ‹هەڵمبڕی تا دەماڵێم کردەوە› ٣. لەت کردن؛ قرتاندن (گوریس و ڕیس) ٤. گۆڕینی ڕێگەی تراو ‹ئاوەکەی هەڵبڕی بۆ نێو جۆگەکەی خۆی› 🇮🇷 ١. بُلند کردن ٢. دوان ـ دوان تعقیب کردن ٣. بُریدن با تیغ ۴. تغیر دادن مسیر مایع

**هەڵبڕینەوە** / helb(i)řînewe/: چاوگ. تیژ کردنەوەی ددانی مشار 🇮🇷 دوبارە تیز کردن دندانەی ارّە

**هەڵبزڕکان** / helbiz(i)řkan/: چاوگ. هەڵبڕزکان؛ هەڵبڕزکین؛ هەڵبڕسکان؛ هەڵبزڕکین؛ هەڵپرووسقیان؛ هەڵپزگران: ١. هەڵپرووکیان؛ ڕەنگ بزرکان ‹وتم: غەم مەخۆ کە ماڵ لە کیس چوو/ ئەبینم ڕەنگت هەڵبزڕکا زووا «پیرەمێرد»› ٢. پرووسقیان؛ بریان (شیر و ...) 🇮🇷 ١. رنگ باختن ٢. بُریدن (شیر و ...)

**هەڵبزڕکاو** / helbiz(i)řkaw/: ئاوەڵناو. ١. هەڵپرووکیاگ؛ ڕەنگ بزرکاو ٢. پرووسقاو؛ براو (شیر) 🇮🇷 ١. رنگ باختە ٢. بُریدە (شیر)

**هەڵبزڕکین** / helbiz(i)řkîn/: ☜ **هەڵبزڕکان**

**هەڵبزۆقان** / helb(i)zoqan/: چاوگ. بەرز و نزم بوونەوە و بزوانە بەرەو بان ‹ماسی زیندوو لە سەر وشکانی هەڵدەبزۆقێ› 🇮🇷 بالا و پایین کردن

**هەڵبزۆقاو** / helb(i)zoqaw/: ئاوەڵناو. هەڵبەز ـ دابەز پێ کراو 🇮🇷 بالا و پایین شدە

**هەڵبزۆقین** / helb(i)zoqîn/: ☜ **هەڵبزۆقینەوە**

**هەڵبزۆقینەوە** / helb(i)zoqînewe/: چاوگ. هەڵبزۆقین؛ بەرزەوە بوون و داکەوتنی لە دوای یەک و بەپەلە 🇮🇷 بالا و پایین کردن سریع و متوالی

**هەڵبژارتن** / helb(i)jartin/: ☜ **هەڵبژاردن**[1]

**هەڵبژارتو** / helb(i)jartû/: ☜ **هەڵبژاردە**

**هەڵبژارتە** / helb(i)jarte/: ☜ **هەڵبژاردە**

**هەڵبژارتی** / helb(i)jartî/: ☜ **هەڵبژاردە**

**هەڵبژاردن**[1] / helb(i)jardin/: چاوگ. هلبژاتن؛ هلبژارتن؛ هەڵبژارتن؛ هەڵبژین؛ هەڵبژنین؛ هەڵبژانن؛ نەقاندن؛ دیاری کردن و جیا کردنەوەی کەسێ یان شتێک لە دەستەیەک بە مەبەستێکەوە ‹خۆشەویستی تۆم هەڵبژارد بۆ خۆم/ لە ڕێی ڕەزاتا هەر وا بەلاجۆم «پیرەمێرد»› 🇮🇷 برگُزیدن

**هەڵبژاردن**[2]: ناو. کار و ڕەوتی دیاری کردن و جیا کردنەوەی کەسێ یان شتێک 🇮🇷 انتخابات

**هەڵبژاردە** / helb(i)jarde/: ئاوەڵناو. هەڵبژێردراو؛ هەڵبژێراو؛ هلبژارتی؛ هەژماردە؛ هەڵبژارتوو؛ هەڵبژارتە؛ هەڵبژارتی؛ هەڵبژراو؛ هەڵبژنیاگ؛ هەڵبژیاگ؛ نەقاندی ‹هەڵبژاردەی خەڵکی کەرکووک بۆ پارلەمانی عیراق› 🇮🇷 برگُزیدە

**هەڵبژانن** / helb(i)janin/: ☜ **هەڵبژاردن**[1]

**هەڵبژران** / helbijran/: ☜ **هەڵبژێران**

**هەڵبژراو / helbijraw/**: ☜ **هەڵبژاردە**

**هەڵبژنیاگ / hełb(i)jinyag/**: ☜ **هەڵبژاردە**

**هەڵبژنین / hełbijnîn/**: ☜ **هەڵبژاردن**[1]

**هەڵبژیاگ / hełbijyag/**: ☜ **هەڵبژاردە**

**هەڵبژین / hełb(i)jîn/**: ☜ **هەڵبژاردن**[1]

**هەڵبژێر / hełb(i)jêr/**: پاشەوشە. ـ هلبژێر؛ ـ هەڵبژێن ☗ انتخاب کننده

**هەڵبژێران / hełb(i)jêran/**: چاوگ. هەڵبژران؛ هەڵبژێردران؛ بژێران؛ بژێردران؛ وە بەر هەڵبژاردن کەوتن ☗ انتخاب شدن

**هەڵبژێراو / hełb(i)jêraw/**: ☜ **هەڵبژاردە**

**هەڵبژێردران / hełb(i)jêrd(i)ran/**: ☜ **هەڵبژێران**

**هەڵبژێردراو / hełb(i)jêrd(i)raw/**: ☜ **هەڵبژاردە**

**هەڵبژێن / hełb(i)jên/**: ☜ **هەڵبژێر**

**هەڵبگاردن / hełb(i)gardin/**: چاوگ. هەڵبواردن: ١. بواردن؛ خۆ لێ لادان ٢. تاڵ و داو لە نێو شتێک ڕاکردن ☗ ١. حَذَر کردن ٢. تار و نخ از چیزی گذراندن

**هەڵبلۆقان / hełb(i)łoqan/**: ☜ **هەڵبلۆقینەوە**

**هەڵبلۆقاو / hełbiłoqaw/**: ئاوەڵناو. هەڵبزۆقاو؛ هەڵبەز ـ دابەز پێ کراو ☗ بە تپش و تکان افتادە

**هەڵبلۆقین / hełb(i)łoqîn/**: ☜ **هەڵبلۆقینەوە**

**هەڵبلۆقینەوە / hełb(i)łoqînewe/**: چاوگ. هەڵبلۆقان؛ هەڵبلۆقین؛ هەڵبزۆقین ☗ جست و خیز کردن سریع و متوالی

**هەڵبواردن / hełb(i)wardin/**: ☜ **هەڵبگاردن**

**هەڵبورونگان / hełburungan/**: ☜ **هەڵبرینگاندن**

**هەڵبو / hełbû/**: ئاوەڵناو. داگرساو؛ داگیرساو ☗ مُشتعل

**هەڵبون / hełbûn/**: چاوگ. ١. بەرەوژوور چوون ٢. داگرسان؛ داگرسیان؛ پێ بوون (ئاگر، چرا، ماشێن و ...) ‹چراکە هەڵنابێ! کوورەکە هەڵبوو!› ٣. جیا بوونەوەی بەشێ، لەتێکی شتێ ‹بە کوتک لەو بەردەم دا، تەلیزمێکی لێ هەڵبوو؛ دڵۆ لە دەستم هەڵبوو› ☗ ١. صعود کردن ٢. افروختن ٣. جدا شدن قطعەای از چیزی

**هەڵبەت / hełbet/**: ئاوەڵکار. هەڵبەتە؛ ئەڵبەت: ١. هەبەت؛ بێ گومان؛ بێ‌سۆ ‹خۆڕایی نییە ناڵەیی گەرم و دەمی سەردم/ هەڵبەت بە بەلاییکەوە ئالاوە دڵی من «بێخود»› ٢. وێدەچێ؛ دەگونجێ؛ لەوانەیە؛ ڕەنگە ‹هەڵبەت لە لای تۆیە!؟› ☗ ١. حتماً؛ لابد ٢. انگار

**هەڵبەتە / hełbete/**: ☜ **هەڵبەت**

**هەڵبەز / hełbez/**: ناو. کاری خۆ حەوا دان؛ خۆ تاو دان بەرەو ژوور ☗ جهش

**هەڵبەزان / hełbezan/**: ☜ **هەڵبەزین**

**هەڵبەزاندن / hełbezandin/**: چاوگ. هلبەزاندن؛ بەرەو ژوور جووڵاندنەوە ☗ ورجهانیدن

**هەڵبەزاندنەوە / hełbezand(i)newe/**: چاوگ. هەڵبەزاننەوە؛ بەرەو ژوور جووڵاندنەوە ☗ ورجهانیدن

**هەڵبەزاننەوە / hełbezan(i)newe/**: ☜ **هەڵبەزاندنەوە**

**هەڵبەز، دابەز / hełbezdabez/**: ناو. هەڵخەوداخە؛ هەڵپەڕ ـ داپەڕ؛ کاری بەرەوژوور خۆ حەوا دان و هاتنە خوار ‹منداڵان لە خۆشییان هەڵبەز ـ دابەزیانە› ☗ جست‌وخیز

**هەڵبەزین / hełbezîn/**: چاوگ. هلبەزان؛ هەڵبەزان؛ هەڵوەزان؛ خۆ حەوادان بەرەو ژوور ‹خۆی پێوا وتی: بالا شەش گەزم/ سەیرم کەن ئەزم وا هەڵدەبەزم! «پیرەمێرد»› ☗ ورجهیدن

**هەڵبەزینەوە / hełbezînewe/**: چاوگ. هەڵوەزانەوە؛ هەڵوەزینەوە: ١. وە زەوی کەوتن و بڵند بوونەوە ‹تۆپەکە دوو جار دای بە زەویدا و هەڵبەزییەوە› ٢. /کنایە/ ئاور تێ بەربوون؛ چاو پەڕینە تەوقی سەر؛ زۆر تووڕە بوون ‹هەر ئەم

قسەیە بیست، لە جێ خۆی هەڵبەزییەوە› ⊠ ١. بر زمین افتادن و دوباره برجستن ٢. از کوره دررفتن

**هەڵبەس / hełbes/:** ☜ **هەڵبەست**

**هەڵبەست[1] / hełbest/:** ناو. هەڵبەس؛ هەڵوەس؛ هەڵوەست: ١. شکستەبەند؛ کەسێ ئێسکی شکاوی لەش دەبەستێتەوە ٢. کەسێ ڕیشوو بادەدا ٣. /کینایە/ ساختە؛ قسەی سەربەخۆی بێ ڕاستی ٤. هلبەست؛ بوێژ؛ شاعیر ٥. بەستە و گۆرانی ٦. هۆنراوە؛ شیعر ⊠ ١. شکستەبند ٢. تاب دهندە ٣. سخن ساختگی ٤. ناظم؛ شاعر ٥. ترانە ۶ شعر

**ـ هەڵبەست[2]:** پاشەوشە. ـ هەڵبەس؛ ـ هەڵوەست؛ ـ هەڵوەس؛ سازدەر ‹قسەهەڵبەست› ⊠ ـ سرا

**هەڵبەستران / hełbest(i)ran/:** چاوگ. هەڵبەسیان: ١. سفت کران و پێچرانەوە ٢. لێک بەستران ٣. /کینایە/ دروست کران (بۆ قسە) ‹ناگونجێ ئەم قورئانە هی خودا نەبێ و هەڵبەسترابێ «هەژار، قورئان»› ٤. با دران ٥. بەند بەستران ‹بەنداوی مەهاباد هەڵبەسترا› ⊠ ١. مُحکم شدن ٢. بە هم بستە شدن ٣. در آوردن (حرف) ٤. تاب دادە شدن ٥. بستە شدن

**هەڵبەستراو / hełbest(i)raw/:** ناوەڵناو. هەڵبەسیاگ: ١. توند و قایم‌کراو ٢. پێکەوە نووسێنراو (ئێسکی شکاو) ٣. بادراو ٤. /کینایە/ ناڕاست؛ دروست کراو (قسە) ٥. داندراو (لە پێش ئاوی جۆگە و چۆم) ⊠ ١. مُحکم شدە ٢. جوش‌خوردە؛ شکستەبندی شدە ٣. تابیدە ٤. ساختگی (سُخن) ٥. احداث شدە (بر نهر و رودخانە)

**هەڵبەستن / hełbestin/:** چاوگ. هەڵوەستن: ١. دابەستن؛ دروست کردن ‹گۆڕم لە پەنا ڕەزان بکۆڵن! ڕەزەوان/ هەڵبەستێ لە پەلک و داری مێو تابووتم «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ٢. بادان (ڕیشوو و ...) ٣. هۆندنەوە (شیعر) ٤. /کینایە/ قسە ساز کردن ‹کە دیم ئالۆزە چاوی، زوو وتم: ئەم فیتنە هەڵبەستە/ وتی جاران ئەتۆ دەتوت بە من: کەم فیتنە هەڵبەستە! «مەحوی»› ٥. بەند دروست کردن لە بەر ئاو ⊠ ١. ساختن ٢. تاب دادن پرز پارچە ٣. بە نظم درآوردن کلام ۴. حرف درآوردن ۵. سد بستن

**هەڵبەستنەوە / hełbest(i)newe/:** چاوگ. ١. شکستەبەندی کردن ٢. دابەستنەوە؛ دروست کردنەوە ⊠ ١. شکستەبندی کردن ٢. دوبارە ساختن

**هەڵبەستوان / hełbestwan/:** ناو. شاعیر؛ هۆنەر ⊠ شاعر

**هەڵبەستە[1] / hełbeste/:** ناو. هلبەستە؛ هەڵبەسە؛ هەڵوەستە: ١. /کینایە/ بوختان؛ بوختیان ٢. بەستە و گۆرانی ⊠ ١. بُهتان ٢. ترانە

**هەڵبەستە[2]:** ناوەڵناو. /کینایە/ هلبەستە؛ هەڵبەسە؛ هەڵبەستراو؛ ناڕاست؛ نارەسەن ‹قسەی هەڵبەستەیان بۆ دەرهێناوە› ⊠ ساختگی؛ جعلی

**هەڵبەسە / hełbese/:** ☜ **هەڵبەستە**

**هەڵبەسیاگ / hełbesyag/:** ☜ **هەڵبەستراو**

**هەڵبەسیان / hełbesyan/:** ☜ **هەڵبەستران**

**هەڵپ / hełp/:** ناو. ١. چاوچنۆکی؛ تەماح ٢. پەلە؛ لەز ⊠ ١. طمع ٢. شتاب

**هەڵپاچ[1] / hełpaç/:** ناو. هەرەس؛ کاری بڕین و لێ‌کردنەوەی زیادی (وەک موو، لقی دار و ...) ⊠ عمل چیدن

**ـ هەڵپاچ[2]:** پاشەوشە. ـ هەڵپچڕ؛ هەڵپاچەر ‹سەرهەڵپاچ؛ دارهەڵپاچ› ⊠ ـ تراش

**هەڵپاچان[1] / hełpaçan/:** ☜ **هەڵپاچین**

**هەڵپاچان[2]:** ناو. گوڵێکی کەم‌تەمەنی بەهارییە، لە تیرەی هەلالان ⊠ شقایق شاخدار زرد

**هەڵپاچران / hełpaçran/:** چاوگ. هەرەس کران؛ لێ‌کرانەوە ⊠ بُریدە شدن

**هەڵپاچراو / hełpaçraw/:** ناوەڵناو. قەیچی‌کراو ⊠

قیچی شده

**هەڵپاچین** / helpaçîn/: چاوگ. هەڵپاچان؛ هەڵقاچین؛ هەرەس کردن؛ برین و لێ کردنەوەی زیادی (وەک مـوو، لـقوپـۆپی دار و ...) ‹دەکا گیرۆدەتر پیرانی دڵتەڕ ئەو کچە کوردەی/ بچێتە مەکتەب و بسکی بە مۆدەی تازە هەڵپاچێ «هێمن»› ☰ قیچی کردن

**. هەڵپچڕ** / -helpiçiř/: ☜ ـ هەڵپاچ[٢]

**هەڵپچڕان** / helpiçřan/: چاوگ. هەڵپچڕین؛ هەڵپچکڕان؛ هەڵپچکڕین؛ هەڵپەچەڕان؛ هەڵچڕان؛ هەڵچڕین: ١. هەڵتەکان ‹قوتووەکە سەری هەڵپچڕاوە› ٢. باز بوون و لە بەر یەک چوونی لێوارەی دوو شت (وەک تەقەڵ، لێو و...) ‹ناوی ئەو لێوە بەرن، دەم هەڵدەپچڕان بۆ دوعا/ وا لە بەر چاوی برینی دڵ هەیە حەققی نمەک «مەحوی»› ٣. تێک‌چوون؛ تێک‌شێوان ☰ ١. کنده شدن ٢. از هم باز شدن ٣. مُتلاشی شدن

**هەڵپچڕاندن** / helpiçřandin/: چاوگ. هەڵپچکڕاندن؛ هەڵپچڕکاندن؛ هەڵپەچەڕاندن؛ هەڵچڕاندن: ١. هەڵتەکاندنی سەری شتێ ٢. دادڕینی تەقەڵ لێ دراو ☰ ١. کندن ٢. شکافتن

**هەڵپچڕاو** / helpiçřaw/: ناوەڵناو. هەڵپچکڕاو؛ هەڵپچڕکاو؛ هەڵچڕاو: ١. سەر لێ هەڵگیراو ٢. دادڕاو؛ هەڵتەکیاگ (تەقەڵ) ☰ ١. کنده شده ٢. شکافته شده

**هەڵپچڕاوە** / helpiçřawe/: ☜ هەڵپچڕاوی

**هەڵپچڕاوی** / helpiçřawî/: ناو. هەڵپچڕاوە؛ جێگەی دڕاو لە جێ تەقەڵان ☰ جای شکافته شده

**هەڵپچڕکان** / help(i)çiřkan/: چاوگ. هەڵپچوڕکان؛ پسانی گەڵا و لک لە ڕووەک ☰ گُسستن برگ و شاخه از گیاه

**هەڵپچڕکاندن** / help(i)çiřkandin/: چاوگ. هەڵپچوڕکاندن؛ پساندن (گەڵا و لک) ‹دوای ئەوە کەوتە دەستی بۆنی کرد/ هەڵیەپچڕکێنا وەک شێت دەست‌وبرد! «پیرەمێرد»› ☰ گُسلانیدن (شاخه و برگ)

**هەڵپچڕکاو** / help(i)çiřkaw/: ☜ هەڵپچڕاو

**هەڵپچڕین** / helpiç(i)řîn/: ☜ هەڵپچڕان

**هەڵپچکڕان** / help(i)çikřan/: ☜ هەڵپچڕان

**هەڵپچکڕاندن** / helpiç(i)křandin/: ☜ هەڵپچڕاندن

**هەڵپچکڕاو** / helpiç(i)křaw/: ☜ هەڵپچڕاو

**هەڵپچکڕین** / helpiç(i)křîn/: ☜ هەڵپچڕان

**هەڵپچوڕکان** / help(i)çuřkan/: ☜ هەڵپچڕکان

**هەڵپچوڕکاندن** / helpiçuřkandin/: ☜ هەڵپچڕکاندن

**هەڵپرتاندن** / helpirtandin/: چاوگ. دەرکردن بە سووکایەتی ☰ دک کردن با اهانت

**هەڵپرچان** / helpirçan/: چاوگ. ڕفان لە نەکاو ☰ ربوده شدن ناگهانی

**هەڵپرچانن** / helpirçanin/: چاوگ. ڕفاندنی لە نەکاو ☰ ربودن ناگهانی

**هەڵپروان** / helpirwan/: چاوگ. هەڵپریوان؛ پریوان؛ پروان؛ بە وردی ڕژانە خوار ☰ ریزه ریزه ریختن از بالا

**هەڵپرواندن** / helpirwandin/: چاوگ. پریواندن؛ پروانن؛ هەڵپریواندن؛ هەڵپروانن؛ بە وردی ڕژاندنە خوار ☰ ریز ریز از بالا ریزش دادن

**هەڵپروانن** / helpirwanin/: ☜ هەڵپرواندن

**هەڵپریوان** / help(i)rîwan/: ☜ هەڵپروان

**هەڵپریواندن** / help(i)rîwandin/: ☜ هەڵپرواندن

**هەڵپڕژان** / helpiřjan/: چاوگ. ١. بڵند بوونی تنۆکە ئاو یان تراو لە عەرزەوە ٢. *[کینایە]* خۆ دەگژ ڕاکردن ‹بوو بە شەڕی خاچپەرستان، دوو هۆردوو بەرانبەر وەستان، پێک هەڵپڕژان، تێک هەڵچڕژان «هەژار، *چوار نامیلکە*»› ☰ ١. بە بالا پاشیدن ٢.

گلاویز شدن برای جنگ

**هەڵپرژاندن / helpiřjandin/**: چاوگ. هەڵپرژانن؛ بەرەو ژوو پرژاندن ☰ سربالا پاشیدن

**هەڵپرژانن / helpiřjanin/**: ☜ هەڵپرژاندن

**هەڵپروزقان / help(i)řuzqan/**: ☜ هەڵپروزکان

**هەڵپروزقانن / help(i)řuzqanin/**: ☜ هەڵپروزکاندن

**هەڵپروزکان / help(i)řuzkan/**: چاوگ. هەڵپروزقان؛ هەڵپروزکین؛ هەڵپروسقان؛ هەڵپروسقیان: ١. ڕفان لە دەستی کەسێ لە نکاو ٢. ڕەنگ پەڕین لە ترسان و لە شتی نەکاو ☰ ١. ناگهان از دست کسی ربودن ٢. رنگ باختن از ترس و رویداد ناگهانی

**هەڵپروزکاندن / help(i)řuzkandin/**: چاوگ. هەڵپروزقانن؛ هەڵپروسقاندن؛ هەڵپروسقانن: ١. ڕفاندن لە دەست لەنکاو ٢. بوونە هۆی ڕەنگ پەڕینی کەسێ ☰ ١. ربودن ناگهانی ٢. سبب رنگ باختن کسی شدن

**هەڵپروزکین / help(i)řuzkîn/**: ☜ هەڵپروزکان

**هەڵپروسقان / help(i)řusqan/**: ☜ هەڵپروزکان

**هەڵپروسقاندن / help(i)řusqandin/**: ☜ هەڵپروزکاندن

**هەڵپروسقانن / help(i)řusqanin/**: ☜ هەڵپروزکاندن

**هەڵپروسقیان / help(i)řusq(i)yan/**: ☜ هەڵپروزکان

**هەڵپرووز / help(i)řûz/**: ناو. ١. ڕەوتی سووتان (موو، خوری و... بە ئاگر) ٢. *[کینایە]* پەلە؛ لەز ☰ ١. فرایند سوختن (مو، پشم و ...) ٢. عجله

**هەڵپرووزان / help(i)řûzan/**: چاوگ. سووتان (موو، خوری و...) ☰ سوختن (مو، پشم ...)

**هەڵپرووزاندن / help(i)řûzandin/**: چاوگ. هەڵپرووزانن؛ سووتاندن (موو، خوری و ...) ☰ سوزاندن (مو، پشم ...)

**هەڵپرووزانن / help(i)řûzanin/**: ☜ هەڵپرووزاندن

**هەڵپرووزاو / help(i)řûzaw/**: ئاوەڵناو. هەڵپرووزیاگ؛ بە ئاگر سووتاو (موو، خوری و...) ☰ سوخته (مو، پشم ...)

**هەڵپرووزیاگ / help(i)řûzyag/**: ☜ هەڵپرووزاو

**هەڵپرووقان / help(i)řûqan/**: ☜ هەڵپرووکان

**هەڵپرووکان / help(i)řûkan/**: چاوگ. هەڵپرووقان؛ هەڵپرووکین: ١. نیوە سووتانی پێست و شتی‌تر ٢. هەڵپرووزان (موو و ...) ☰ ١. نیمسوز شدن ٢. سوختن (مو و ...)

**هەڵپرووکاندن / help(i)řûkandin/**: چاوگ. هەڵپرووکانن: ١. کەم تا کورتێک سووتاندن ٢. سووتاندن (موو و خوری و ...) ٣. هەڵقرچان؛ چرچ تێکەوتن لە وشکی و گەرما ‹کردییە ڕەهێڵە و باران/ دوایی هەڵپرووکان «پیرەمێرد»› ☰ ١. سوزاندن سطحی ٢. سوزاندن (مو و پشم و ...) ٣. از شدت خشکی و گرما چروک برداشتن

**هەڵپرووکانن / help(i)řûkanin/**: ☜ هەڵپرووکاندن

**هەڵپرووکیان / help(i)řûkyan/**: ☜ هەڵبزڕکان ١ـ

**هەڵپرووکین / help(i)řûkîn/**: ☜ هەڵپرووکان

**هەڵپزان / help(i)zan/**: چاوگ. ماسین و با کردن ☰ آماسیدن

**هەڵپزگران / helpizg(i)řan/**: ☜ هەڵبزڕکان

**هەڵپژان / help(i)jan/**: چاوگ. پژان؛ پژیان بەرەو سەر ‹باتیل موقابیلی حەق وەستا، بەتاڵە ئیشی/ گەردی بە بادە خاکێ پێ هەڵپژێ بە گەردوون «مەحوی»› ☰ پاشیده شدن به بالا

**هەڵپسان / help(i)san/**: چاوگ. هەڵکێشیان؛ پسان بە هۆی هەڵکێشان ☰ گُسستن

**هەڵپساندن** / help(i)sandin/: چاوگ. هەڵکێشان؛ پساندن بە هۆی هەڵکێشان ‹سەری چۆلەکەی هەڵدەپساند› ☰ گُسلانیدن

**هەڵپساو** / help(i)saw/: ☜ **هەڵپسێتراو**

▪ **هەڵپسێن** / -helpisên/: پاشەوشە. ـــ هەڵکێش؛ جیاکەرەوە ☰ ـ برکش

**هەڵپسێندراو** / helpisênd(i)raw/: ☜ **هەڵپسێتراو**

**هەڵپسێنراو** / helpisênraw/: ئاوەڵناو. هەڵپساو؛ هەڵپسێندراو؛ هەڵکێشیاگ؛ قرتاو بە هۆی کێشران بۆ سەرەوە ☰ گُسسته

**هەڵپشافتن** / help(i)şaftin/: ☜ **هەڵپشاوتن**

**هەڵپشافتی** / help(i)şaftî/: ☜ **هەڵپشاوتە**

**هەڵپشاوتن** / help(i)şawtin/: چاوگ. هلپشافتن؛ هەڵپشافتن؛ هەڵشلەپاندن؛ پشاوتن؛ (لە ناو دەستدا) گوشین و هەڵگلۆفین ☰ فشُردن و مُچاله کردن

**هەڵپشاوتە** / help(i)şawte/: ئاوەڵناو. هلپشافتی؛ هەڵپشافتی؛ هەڵپشێوراو؛ گوشراو ☰ مُچاله شده

**هەڵپشکوتن** / helpişkûtin/: چاوگ. ١. لەپڕ پەیدا بوون ٢. لەپڕ بەرزەوە بوونی گڕی ئاگر ٣. پەیدا بوونی شتی وەک زیپکەی زۆر لە پێست و ... ☰ ١. ناگهان پدیدار شدن ٢. ناگهان زبانه کشیدن آتش ٣. سر در آوردن (مانند: جوش بر پوست)

**هەڵپشکوتو** / helpişkûtû/: ئاوەڵناو. هەڵزریاگ؛ هەڵزریاو؛ وردەجۆشی زۆر دەرکردوو ☰ جوش زده

**هەڵپشێوران** / help(i)şêwran/: چاوگ. گوشران ☰ مُچاله شدن

**هەڵپشێوراو** / helpişêwraw/: ☜ **هەڵپشاوتە**

**هەڵپفان** / help(i)fan/: چاوگ. هەڵپفیان؛ هەڵپفین: ١. هەڵمسان؛ ماسین ٢. *[کینایە]* تووڕە بوون و باکردن لە ڕکان ٣. هەڵاتن و بەرز بوونەوە (هەویر و...) ☰ ١. باد کردن ٢. بسیار خشمگین شدن ٣. ورآمدن (خمیر و ...)

**هەڵپفاندن** / help(i)fandin/: چاوگ. ١. ئاوساندن؛ ماساندن؛ با تێ‌کردن ٢. *[کینایە]* تووڕە کردن ٣. هەڵهێنان (هەویر و...) ☰ ١. باد کردن ٢. خشمگین کردن ٣. برآوردن (خمیر و ...)

**هەڵپفاو** / help(i)faw/: ئاوەڵناو. هەڵپفیاو؛ هەڵپفیای؛ باکردوو ☰ بادکرده

**هەڵپفیان** / helpifyan/: ☜ **هەڵپفان**

**هەڵپفیاو** / helpifyaw/: ☜ **هەڵپفاو**

**هەڵپفیای** / helpifyay/: ☜ **هەڵپفاو**

**هەڵپفین** / help(i)fin/: ☜ **هەڵپفان**

**هەڵپلان** / help(i)lan/: چاوگ. ئاوێتە/ تێکەڵ کردن ☰ آمیختن

**هەڵپلانن** / help(i)lanin/: چاوگ. تلانـدن؛ تلاندنەوە ☰ غلتاندن

**هەڵپلۆخان** / help(i)łoxan/: چاوگ. هەڵپلۆخین؛ داپلۆخان؛ داپلۆسیان؛ لە تاوی گەرم شل بوون ☰ وا رفتن از گرما

**هەڵپلۆخاندن** / help(i)łoxandin/: چاوگ. بوونە هۆی داپلۆخان ‹ئاوی کولاوی پێدا کرد و هەڵیپلۆخاند› ☰ پلاسیده کردن به وسیله‌ی حرارت

**هەڵپلۆخاو** / help(i)łoxaw/: ئاوەڵناو. لەبەریەکچوو لە تینی ئاگر ‹گۆشتەکە هەڵپلۆخاوە› ☰ وارفته از گرما

**هەڵپلۆخین** / help(i)łoxîn/: ☜ **هەڵپلۆخان**

**هەڵپلۆسان** / help(i)łosan/: ☜ **هەڵپلۆسکان**

**هەڵپلۆسکان** / help(i)łoskan/: چاوگ. *[مەجاز]* هەڵپلۆسان؛ هەڵپلۆسکیان؛ گیان دان؛ لە ژیان بێبەش بوون ☰ جان دادن

**هەڵپلۆسکانن** / help(i)łoskanin/: چاوگ. مراندن ☰ میراندن

**هەڵپلۆسکیاگ** / help(i)łosk(i)yag/: ئاوەڵناو. *[کینایە]* مرێندراو؛ کوژراو ☰ کُشته شده

**هەڵپلۆسکیان** / help(i)losk(i)yan/: ☜ **هەڵپلۆسکان**

**هەڵپلو** / help(i)lû/: ناو. کاری لابەلا و بێفایده ☰ کار بیهوده

**هەڵپۆقین** / helpoqîn/: چاوگ. هەڵتۆقین؛ هەڵتۆقان ☰ بیرون زدن

**هەڵپە** / helpe/: ناو. ١. پەلە؛ لەز ٢. تەما؛ تەماح؛ چاوچنۆکی ٣. هەنکەی سەگ لە گەرمان ☰ ١. شتاب ٢. طمع ٣. لەلە سگ از گرما

**هەڵپەچەڕان** / helpeçeřan/: ☜ **هەڵپچڕان**

**هەڵپەچەڕاندن**/ helpeçeřandin/: ☜ **هەڵپچڕاندن**

**هەڵپەرتاوتن** / helpertawtin/: چاوگ. هەڵپەرداوتن؛ هەڵپەڕتاوتن؛ هەڵپەژنین: ١. پەرتاوتن؛ لکەدار پەڕاندن ‹یەکێ ماڵۆو دەکا، یەک دادەچێنێ تازە شیناوەرد/ ئەوەی تر هەڵدەپەرتێوێ لکوپۆپی چلووکی دار «هێمن»› ٢. /کینایە/ ڕێکوپێک کردنی شتی شپرز یان نارێک ‹ناو ماڵەکە هەڵپەرتێوە› ☰ ١. هرس کردن ٢. مُرتب کردن

**هەڵپەرتاوتو** / helpertawtû/: ئاوەڵناو. هەڵپەڵ ☰ هرس شده

**هەڵپەرداوتن** / helperdawtin/: ☜ **هەڵپەرتاوتن**

**هەڵپەڕ** / helpeř/: لێل. ← **هەڵپەڕداپەڕ**

**هەڵپەڕان** / helpeřan/: چاوگ. هەڵبەزین؛ خۆ حەوادان بە توندی ☰ جهیدن

**هەڵپەڕاندن** / helpeřandin/: چاوگ. ١. ڕەقساندن؛ بە هەڵپەڕکێ خستن ٢. /کینایە/ هەڵسووڕاندن؛ بەڕێوە بردن ☰ ١. رقصانیدن ٢. گرداندن

**هەڵپەڕتاوتن** / helpeřtawtin/: ☜ **هەڵپەرتاوتن**

**هەڵپەڕداپەڕ** / helpeř dapeř/: ناو. هەڵپەڕوداپەڕ: ١. هەڵبەزدابەز؛ بازبازان ‹ئەو هەموو هەڵپەڕداپەڕەت لە چییە؟› ٢. /کینایە/ کۆشش و تەقالای باش و بەفایدە ‹بۆ کردنەوەی ئەو ماڵە زۆری هەڵپەڕداپەڕ کرد› ☰ ١. جستوخیز ٢. کوشش و تلاش مُفید

**هەڵپەڕکێ** / helpeřkê/: ناو. ڕەقس و سەما ☰ رقص و پایکوبی

**هەڵپەڕکێکەر** / helpeřkêker/: ناو. ئەوەی هەڵپەڕکێ دەکا و لێی دەزانێ ☰ رقصنده

**هەڵپەڕوداپەڕ** / helpeř û dapeř/: ☜ **هەڵپەڕداپەڕ**

**هەڵپەڕین** / helpeřîn/: چاوگ. هلپەڕین؛ سەما کردن؛ ڕەخسین ‹هەر تەیر و تووڕە وەک من ئەخوێنن لە خۆشییا/ هەر باخەوانە ئارەزوویی هەڵپەڕین ئەکا «بێخود»› ☰ رقصیدن

**هەڵپەژنین** / helpejnîn/: ☜ **هەڵپەرتاوتن**

**هەڵپەسارتن** / helpesartin/: ☜ **هەڵپەساردن**

**هەڵپەسارتو** / helpesartû/: ☜ **هەڵپەسارده**

**هەڵپەسارتە** / helpesarte/: ☜ **هەڵپەسارده**

**هەڵپەساردن** / helpesardin/: چاوگ. تێپەڕ. //هەڵتپەسارد؛ هەڵدەپەسێری؛ هەڵپەسێرە// هەڵپەسارتن؛ هەڵسپاردن؛ پەساردن؛ پەسارنایەوە: ١. لێ نەوین و بە شتێکەوە پاڵ دان ‹ئەو گەسکانە بە دیوارەوە هەڵپەسێرە!› ٢. /کینایە/ لە کار لابردن و چاوەڕوان ڕاگرتن ‹چەندین ڕۆژنامەیان هەڵپەسارد› ☰ ١. تکیە دادن ٢. مُعلق کردن از کار

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: هەڵپەساردوو/ چاوگی نەرێنی: هەڵنەپەساردن

**هەڵپەساردو** / helpesardû/: ☜ **هەڵپەسارده**

**هەڵپەسارده** / helpesarde/: ئاوەڵناو. هەڵپەسارتوو؛ هەڵپەسارتە؛ هەڵپەساردوو؛ هەڵپەسێراو؛ هەڵسپاردە: ١. پاڵ بە شتێکەوە دراو ٢. /کینایە/ بێکار کراوی چاوەڕوان ڕاگیراو ٣. ماتڵ؛ دەسەوسان ☰ ١. تکیە بر چیزی دادە ٢. مُعلق شده از کار ٣. مُعطل

**هەڵپەسێران / helpesêran/**: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //هەڵپەسێرای؛ هەڵدەپەسێرێی؛ هەڵپەسێرێ// هەڵسپێران؛ هەڵسپێریان: ١. بە شتێکەوە پاڵ دران ٢. [کینایە] لە کار وەلا نران و چاوەنۆڕ کران ☰ ١. تکیه داده شدن ٢. مُعلق شدن از کار

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: هەڵپەسێراو/ چاوگی نەرێنی: هەڵنەپەسێران

**هەڵپەسێراو / helpesêraw/**: ☜ **هەڵپەسارده**

**هەڵپەسێندران / helpesênd(i)ran/**: ☜ **هەڵپەسێران**

**هەڵپەسێنران / helpesênran/**: چاوگ. هەڵپەسێندران؛ لێک بەر بوونەوە بە هۆی کێشان بۆ سەرەوە ☰ پاره شدن از کشیدن به سمت بالا

**هەڵپەقژین / helpeqjîn/**: چاوگ. مچوڕک پێدا هاتن و لەرزین ☰ چندش آمدن و تیر کشیدن اندام

**هەڵپەل / helpel/**: ئاوەڵناو. هەڵپەرتاوتوو ☰ هرس شده

**هەڵپەلە / helpele/**: ناو. ١. وڕاوە؛ ورینە ٢. [کینایە] کاری لابەلا و بێفایدە ☰ ١. هذیان ٢. کار بیهوده

**هەڵپەندمان / helpend(i)man/**: ☜ **هەڵپەنمان**

**هەڵپەنمان / helpen(i)man/**: چاوگ. هەڵپەنمین؛ هەڵپەندمان: ١. هەڵپەنەمان؛ هەڵامسان؛ هەڵپفان ٢. لە خەو ڕاپەڕین ☰ ١. باد کردن ٢. از خواب پریدن

**هەڵپەنمانن / helpen(i)manin/**: چاوگ. هەڵپەنمین: ١. هەڵامساندن؛ هەڵپفاندن؛ هەرپەرچفین ٢. لەپڕ لە خەو ڕاپەڕاندن ☰ ١. آماساندن ٢. ناگهان از خواب بیدار کردن

**هەڵپەنمین / helpen(i)mîn/**: چاوگ. ١. ☜ **هەڵپەنمان** ٢. ڕاچڵەکین؛ داچڵەکیان ☰ ١. ☜ **هەڵپەنمان** ٢. یکّه خوردن

**هەڵپەنەمان / helpeneman/**: ☜ **هەڵپەنمان ـ١**

**هەڵپەهەڵپ / helpehelp/**: ناو. ١. هەناسەی زۆری سەگ لە گەرمان ٢. کاری بەپەلە خواردن ٣. [کینایە] هەوڵ و پەلەی زۆر بۆ بە دەست هێنانی شتێک ☰ ١. لەله پیاپی سگ از شدت گرما ٢. عمل با شتاب خوردن ٣. حرص

**هەڵپیت / helpît/**: ناو. کار و ڕەوتی پەرتاوتن؛ هەڵپەرتاوتن ☰ هرس

**هەڵپیتاندن / helpîtandin/**: چاوگ. هەڵپەرتاوتن؛ لک پەرتاندن و جوان کردنی دار و... ☰ هرس کردن

**هەڵپین / helpîn/**: چاوگ. هەناسەسوار بوونی سەگ لە گەرمان ☰ لەله زدن سگ

**هەڵپێچ / helpêç/**: ناو. جۆرێ شواڵی ژنانە ‹دەرپێی هەڵپێچی دەبەردایە› ☰ نوعی شلوار زنانه

**هەڵپێچان / helpêçan/**: چاوگ. تێنەپەڕ. تێپەڕ. //هەڵپێچای؛ هەڵدەپێچی؛ هەڵپێچە// □ تێنەپەڕ. ١. هەڵپێچیان؛ هەڵپێچران؛ هەڵکران؛ هەڵماڵیان؛ بە سەر یەکا پێچیان بۆ سەرەوە □ تێپەڕ. ٢. هەڵکردن؛ هەڵماڵین؛ بە سەر یەکا پێچاندن بۆ سەرەوە ٣. زۆر بۆ هێنان و گەڕ تێ هاڵاندن ‹هەڵپێچاوم جلکی دەوێ› ٤. پێچانەوەی دۆڵمەی یاپراغ ٥. بادانی ڕیشوو ٦. داخستن و خەفاندن؛ کۆتایی پێ هێنان ‹هەر تاریکی کرد، گشت دووکانیان هەڵپێچا› ☰ ١و٢. ورمالیدن ٣. اصرار کردن ۴. پیچیدن دُلمەی برگ مو ۵. تاب دادن پُرز کنارەی لباس ۶. بستن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: هەڵپێچراو/ چاوگی نەرێنی: هەڵنەپێچان

**هەڵپێچاو / helpêçaw/**: ☜ **هەڵپێچراو**

**هەڵپێچران / helpêçran/**: ☜ **هەڵپێچان ـ١**

**هەڵپێچراو / helpêçraw/**: ئاوەڵناو. هەڵپێچاو؛ هەڵپێچرای؛ هەڵپێچیاگ: ١. لە خوار بۆ سەر پێچدراو ٢. زۆر بۆ هاتوو لە لایەن کەسێکەوە ٣. نووشتاوە (دۆڵمە و ...) ٤. بادراو (ڕیشوو) ٥.

داخراو؛ تەعتیل کراو ☰ ١. ورمالیده ٢. تحت فشار قرار گرفته ٣. پیچیده (دُلمه و ...) ۴. تاب‌خورده (پُرز) ۵. بسته شده

**هەڵپێچرای** / helpêçray/: ☜ **هەڵپێچراو**

**هەڵپێچیاگ** / helpêçyag/: ☜ **هەڵپێچراو**

**هەڵپێچیان** / helpêçyan/: ☜ **هەڵپێچان ـ١**

**هەڵپێک** / helpêk/: ناو. ڕەوتی داخران؛ بە سەر یەکا هاتنی دوو لای درگا و پەنجەرە و... ☰ چفت

**هەڵپێکان** / helpêkan/: چاوگ. هەڵپێکانن؛ داخستن؛ بە سەر یەکا جووت کردن ‹درگاکە هەڵپێکە!؛ دوگمەی کراسەکەت هەڵپێکە!› ☰ چفت کردن

**هەڵپێکانن** / helpêkanin/: ☜ **هەڵپێکان**

**هەڵپێکران** / helpêkran/: چاوگ. داخران؛ بەسیان ☰ بسته شدن

**هەڵپێکراو** / helpêkraw/: ئاوەڵناو. هەڵپێکیاگ؛ داخراو؛ بەسیاگ ☰ چفت شده

**هەڵپێکیاگ** / helpêkyag/: ☜ **هەڵپێکراو**

**هەڵتاش** / heltaş/: ناو. کاری تاشین بەرەو ژوور ☰ عمل تراشیدن از پایین به بالا

**هەڵتاشان** / heltaşan/: ☜ **هەڵتاشین**

**هەڵتاشین** / heltaşîn/: چاوگ. هەڵتاشان؛ تاشین بەرەو ژوور ☰ تراشیدن از پایین به بالا

**هەڵتاواندن** / heltawandin/: چاوگ. هەزم کردن ‹ورگی من بەردیش هەڵئەتاوێنێ!› ☰ هضم کردن

**هەڵتاوین** / heltawîn/: چاوگ. هەزم بوون ☰ هضم شدن

ـ **هەڵتاوێن** / heltawên/: پاشەوشە. هەزمکەر ‹چەوری‌هەڵتاوێن› ☰ هضم‌کننده

**هەڵترنگانن** / helt(i)ringanin/: چاوگ. سڵ بوون و خۆ زیز کردن ☰ ترسیدن و رمیدن

**هەڵتروشک** / helt(i)ruşk/: ناو. دون؛ چینچک ☰ چُمباتمه

**هەڵتروشکان** / helt(i)ruşkan/: چاوگ. تێنەپەڕ. //هەڵتروشکای؛ هەڵدەتروشکێی؛ هەڵتروشکێ// هەڵتروشکین؛ هەڵتروشەکان؛ هەڵترووشکان؛ هەڵتوترین؛ هەڵتوروشکان؛ هەڵتوروشکین؛ هەڵتووتان؛ هەڵتووتەکان؛ هەڵچیچەکان؛ قونەڵتس‌دان؛ لە سەر چینچک ڕۆنیشتن ‹ڕۆژێ گوربەیەک، پرخەت و خاڵێ/ هەڵتروشکابوو لە گۆشەی ماڵێ «قانع»› ☰ چُمباتمه زدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: هەڵتروشکاو/ چاوگی نەرێنی: هەڵنەتروشکان

**هەڵتروشکاندن** / helt(i)ruşkandin/: چاوگ. تێپەڕ. //هەڵتروشکاندت؛ هەڵدەتروشکێنی؛ هەڵتروشکێنە// هەڵتروشکانن؛ لە سەر چینچک دانیشاندن ☰ چُمباتمه نشاندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـــ/ چاوگی نەرێنی: هەڵنەتروشکاندن

**هەڵتروشکانن** / helt(i)ruşkanin/: ☜ **هەڵتروشکاندن**

**هەڵتروشکاو** / helt(i)ruşkaw/: ئاوەڵناو. لە سەر چینچک نیشتوو ☰ چُمباتمه زده

**هەڵتروشکین** / helt(i)ruşkîn/: ☜ **هەڵتروشکان**

**هەڵتروشەکان** / helt(i)ruşekan/: ☜ **هەڵتروشکان**

**هەڵترۆپاندن** / helt(i)ropandin/: چاوگ. تۆپاندن ☰ مُردار کردن

**هەڵترۆپاو** / helt(i)ropaw/: ئاوەڵناو. تۆپیو ☰ مُردار

**هەڵترۆپین** / helt(i)ropîn/: چاوگ. تۆپین ☰ مُردار شدن

**هەڵترووشکان** / helt(i)rûşkan/: ☜ **هەڵتروشکان**

**هەڵترەکان** / helt(i)rekan/: چاوگ. ١. ترەکان؛ تەبقان؛ تەقیان؛ تەقین ٢. درز بردن ☰ ١. ترکیدن

٢. شکافته شدن

**هەڵترەکاندن / helt(i)rekandin/**: چاوگ. ١. ترەکاندن؛ تەبقاندن؛ تەقاندن ٢. درز تێخستن ⯀ ١. ترکاندن ٢. شکافتن

**هەڵترەکیان / helt(i)rekyan/**: چاوگ. تەقین؛ ترەکیان ⯀ ترکیدن

**هەڵتراندن / helt(i)řandin/**: چاوگ. *[ناشیرین]* هەڵترانن؛ دەرکردن بە سووکایەتی ⯀ راندن با اهانت

**هەڵترانن / helt(i)řanin/**: ☜ هەڵتراندن

**هەڵترە / helt(i)ře/**: ↓

⊡ **هەڵترە لێ کردن**: بە سووکایەتییەوە دە گـژڕا چوون و دەرکردن ⯀ بیرون کردن

**هەڵتلیشانن / helt(i)lîşanin/**: ☜ هەڵتلیشاندن

**هەڵتلۆپان / helt(i)łopan/**: چاوگ. هەڵتلۆپین؛ تۆپین؛ کەوتین ⯀ سَقَط شدن

**هەڵتلۆپین / helt(i)łopîn/**: ☜ هەڵتلۆپان

**هەڵتڵیشان / helt(i)łîşan/**: چاوگ. ١. هەڵتلیشیان؛ لە بەر یەک چوون؛ لە خوارەوە بۆ سەر دڕان ٢. هەڵتلیشاندن؛ هەڵدڕین ⯀ ١و٢. ورشکافتن

**هەڵتڵیشاندن / helt(i)łîşandin/**: چاوگ. هەڵتلیشانن؛ هەڵدڕین؛ لە خوارەوە بۆ سەر دڕین ⯀ ورشکافتن

**هەڵتڵیشانن / helt(i)łîşanin/**: ☜ هەڵتڵیشاندن

**هەڵتڵیشاو / helt(i)łîşaw/**: ئاوەڵناو. لە سەر تا خوار دادڕاو ⯀ ورشکافته

**هەڵتڵیشیان / helt(i)łîşyan/**: چاوگ. هەڵتلیشان؛ هەڵدڕان؛ لە خوارەوە بۆ سەر دڕیان ⯀ ورشکافتن

**هەڵتوترین / heltut(i)rîn/**: ☜ هەڵتروشکان

**هەڵتوروشکان / helturuşkan/**: ☜ هەڵتروشکان

**هەڵتوروشکین / helturuşkîn/**: ☜ هەڵتروشکان

**هەڵتۆز / heltoz/**: ناو. هەڵتووز؛ هەڵتیز؛ کاری جووتە هاویشتن و قوشقی بوون ⯀ جُفتک پرانی و رمیدن

⊡ **هەڵتۆز کردن**: ☜ هەڵتۆزاندن ـ١

**هەڵتۆزان / heltozan/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //هەڵتۆزای؛ هەڵدەتۆزێی؛ هەڵتۆزێ// هەڵتیزان؛ لە جێوە هەڵبەزینەوە و لووشک خستن ⯀ جُفتک پراندن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: هەڵنەتۆزان

**هەڵتۆزاندن / heltozandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //هەڵتۆزاند؛ هەڵدەتۆزێنی؛ هەڵتۆزێنە// هەڵتووزاندن: ١. هەڵتۆزانەوە؛ هەڵتیزاندن؛ هەڵجووزان؛ هەڵجووزانن؛ هەڵجووزین؛ هەڵتۆز کردن ٢. *[کینایە، پلار]* زۆر تووڕە و قوشقی کردن ‹مەقالێکم لە سەر بەرنامەی ڕادیۆ کوردی بەغدا هەبوو، زەعیم وەحیدی هەڵتۆزاندبوو «هەژار، چێشتی مجێور»› ⯀ ١. رمیدن و جُفتک پراندن ٢. بسیار عصبانی کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: ـ/ چاوگی نەرێنی: هەڵنەتۆزاندن

**هەڵتۆزانەوە / heltozanewe/**: چاوگ. ١. ☜ هەڵتۆزاندن ـ١ ٢. کزانەوەی برین ⯀ ١. ☜ هەڵتۆزاندن ـ١ ٢. سوزش داشتن زخم

**هەڵتۆزێن / heltozên/**: ئاوەڵناو. تیزۆ؛ سڵوقەڵس ⯀ پرخاشگر

**هەڵتۆقان / heltoqan/**: ☜ هەڵتۆقین

**هەڵتۆقاندن / heltoqandin/**: چاوگ. هەڵتۆقانن: ١. قیتەوە کردن ‹بەرد لە سەرم کەوت هەڵیتۆقاند› ٢. تەقاندن؛ تەقانن ⯀ ١. برجسته کردن ٢. ترکاندن

**هەڵتۆقانن / heltoqanin/**: ☜ هەڵتۆقاندن

**هەڵتۆقاو / heltoqaw/**: ☜ هەڵتۆقیو

**هەڵتۆقاوی / heltoqawî/**: ناو. گرووز؛ پەنەماوی ⯀ ورم یا برآمدگی

**هەڵتۆقیاگ / heltoq(i)yag/**: ☜ هەڵتۆقیو

**هەڵتۆقیان / heltoq(i)yan/**: ☜ هەڵتۆقین

**هەڵتۆقین / heltoqîn/**: چاوگ. هەڵتۆقان؛

هەڵتۆقیان؛ هەڵزەپەتان؛ هەڵزڕەپان؛ هەڵزیپان؛ دەرپەڕین؛ بەرزەو بوون ‹کارگ هەڵتۆقی› بیرون زدن

**هەڵتۆقیو / hełtoqîw**: ناوەڵناو. هەڵتۆقاو؛ هەڵتۆقیاگ؛ هەڵسیاگ؛ دەرپەڕاو؛ بەرز و قیتەوەبوو برآمده

**هەڵتوتان / hełtûtan**: ☜ هەڵتروشکان

**هەڵتوتەک / hełtûtek**: ناو. دون؛ چینچک چُمباتمه

**هەڵتوتەکان / hełtûtekan**: ☜ هەڵتروشکان

**هەڵتوتەکاو / hełtûtekaw**: ناوەڵناو. هەڵتووتەکیو؛ هەڵتروشکاو چُمباتمه زده

**هەڵتوتەکیو / hełtûtekîw**: ☜ هەڵتوتەکاو

**هەڵتوران / hełtûřan**: چاوگ. ١. زگەشۆرە گرتن و فیڕاندن ٢. لووشک خستن؛ جووتە هاویشتن ١. اسهال شدن ٢. جُفتک پراندن

**هەڵتوراندن / hełtûřandin**: چاوگ. هەڵتووڕانن: ١. جووتە هاویشتن و قنگ بەرز کردنەوە ٢. فیڕاندن؛ زگ چوون ١. رمیدن و جُفتک پراندن ٢. اسهال شدن

**هەڵتورانن / hełtûřanin**: ☜ هەڵتوراندن

**هەڵتوز / hełtûz**: ☜ هەڵتۆز

**هەڵتوزان / hełtûzan**: چاوگ. سووتانەوە؛ برژانەوە؛ تووزانەوە سوختن (پوست)

**هەڵتوزاندن / hełtûzandin**: ☜ هەڵتۆزاندن

**هەڵتەزینەوە / hełtezînewe**: چاوگ. راپەڕین؛ شۆڕش کردن قیام کردن

**هەڵتەقان / hełteqan**: ☜ هەڵتەقین

**هەڵتەقیان / hełteqyan**: ☜ هەڵتەقین

**هەڵتەقین / hełteqîn**: چاوگ. هەڵتەقان؛ هەڵتەقیان: ١. لە بەر یەک چوون ‹خانوەکە هەڵتەقاوە› ٢. دادڕانی دروا و ٣. تووشی یەک هاتن ١. از هم گُسستن ٢. جر خوردن ٣. با هم برخورد کردن؛ به هم رسیدن

**هەڵتەک / hełtek**: لێل. ← هەڵتەکداتەک

**هەڵتەکان / hełtekan**: چاوگ. هەڵتەکیان؛ هەڵتەکین: ١. لە خوار بۆ سەر تێک چوون ٢. بەرەژوور چوونی ئەندامی لەش ١. از پایین به بالا در رفتن و متلاشی شدن ٢. به بالا جستن اعضای بدن

**هەڵتەکاندن / hełtekandin**: چاوگ. هەڵتەکانن: ١. تێک و پێکدان ‹بوومەلەرزە زۆر ماڵی هەڵتەکاند› ٢. بڵند کردن و بەرەژوور بردنی ئەندامی لەش ‹چاوی لێ هەڵتەکاند؛ بڕۆی هەڵتەکاند؛ شان هەڵتەکێنە!› ٣. تەکاندنی شت ‹بەرسیلە نەختێ خوێی لەگەڵ بێنە/ لە کاسەیەکا هەلیتەکێنە! «پیرەمێرد»› ٤. داتەقاندنی دەغڵ و دان و ... ‹تووتنەکە هەڵتەکێنە› ١. مُتلاشی کردن ٢. بالا انداختن اعضای بدن ٣. تکاندن ۴. باد دادن (غله و ...)

**هەڵتەکانن / hełtekanin**: ☜ هەڵتەکاندن

**هەڵتەکداتەک / hełtekdatek**: ناو. هەڵتەک ـ هەڵتەک؛ چۆنیەتی بان و خوار کردنی یەک لە دوای یەک (زۆرتر لە ڕۆییندا) ‹هەڵتەکداتەکی ماشینەکە ناوسکمانی بڕی!›. هەروەها: **هەڵتەکداتەک کردن** حالت بالا و پایین شدن (بیشتر در حرکت)

**هەڵتەکوپەڵتەک / hełtek û pełtek**: ناو. کاری بە لۆقاوی درێژ و بە پەلە ڕۆیشتن؛ قەترە کردن عمل یا فرانید با گام‌های بلند و با شتاب رفتن

**هەڵتەکەهەڵتەک[1] / hełtek hełtek**: ☜ هەڵتەکداتەک

**هەڵتەک . هەڵتەک[2]**: ناوەڵکار. *[کینایە]* هێدی ـ هێدی؛ لۆژەلۆژ؛ لەقەلەق؛ بە پشوو و لە سەر خۆ (ڕۆیشتن) سلانه سلانه

**هەڵتەکیان / hełtekyan**: ☜ هەڵتەکان

**هەڵتەکین** / hełtekîn/: ☜ **هەڵتەکان**

**هەڵتەکێن** / hełtekên/: پاشەوشە. ١. لە بەر یەک بەر ‹ماڵ‌هەڵتەکێن› ٢. تەکاندەری ئەندام ‹برۆهەڵتەکێن› ٣. تەکێنەری بەڕە و لێفە و... ☰ ١. ویرانگر ٢و٣. ـ تکاننده

**هەڵتیز** / hełtîz/: ☜ **هەڵتۆز**

**هەڵتیزان** / hełtîzan/: ☜ **هەڵتۆزان**

**هەڵتیزاندن** / hełtîzandin/: ☜ **هەڵتۆزاندن ـ١**

**هەڵتیقان** / hełtîqan/: چاوگ. هەڵبەزین بۆ کایە کردن ☰ جست‌وخیز کردن

**هەڵجوزان** / hełcûzan/: ☜ **هەڵتۆزاندن ـ١**

**هەڵجوزانن** / hełcûzanin/: ☜ **هەڵتۆزاندن ـ١**

**هەڵجوزین** / hełcûzîn/: ☜ **هەڵتۆزاندن ـ١**

**هەڵجوزێن** / hełcûzên/: ئاوەڵناو. سڵ و جووتەوەشێن ☰ رموک و جُفتک‌پران

**هەڵجەڕ** / hełceř/: ئاوەڵناو. خێل؛ خوێل؛ چاوخوار ☰ لوچ

**هەڵجەڕاندن** / hełceřandin/: چاوگ. هەڵجەڕانن؛ جەڕ دان؛ زۆر سفت کردنەوە ☰ مُحکم بستن

**هەڵجەڕانن** / hełceřanin/: ☜ **هەڵجەڕاندن**

**هەڵجیپاندن** / hełcîpandin/: چاوگ. گەلاڵە کردن؛ ئامادە کردن بە نیواونیوی ☰ کم و بیش آمادە کردن

**هەڵچ** / hełç/: ناو. کارگ؛ کوارگ؛ قارچک ☰ قارچ

**هەڵچرچان** / hełçirçan/: چاوگ. ١. چرچ و لۆچ تێکەوتن ٢. سیس بوون ☰ ١. پُر چین و چروک شدن ٢. پژمُردە شدن

**هەڵچرچاو** / hełçirçaw/: ئاوەڵناو. ١. هەڵچرچیاگ؛ چرچ‌بوو ٢. سیس‌بوو ☰ ١. پُرچین و چروک شده ٢. پژمُردە شده

**هەڵچرچیاگ** / hełçirç(i)yag/: ☜ **هەڵچرچاو ـ١**

**هەڵچڕان** / hełç(i)řan/: چاوگ. ١. ☜ **هەڵپچڕان** ٢. دڕان؛ دڕیان ☰ ١. ☜ **هەڵپچڕان** ٢. پارە شدن

**هەڵچڕاندن** / hełç(i)řandin/: ☜ **هەڵپچڕاندن**

**هەڵچڕاو** / hełç(i)řaw/: ☜ **هەڵپچڕاو**

**هەڵچڕژان** / hełçiřjan/: چاوگ. *[کینایە]* خۆ دەگژ ڕاکردن ‹دوو هۆردوو بەرانبەر وەستان، پێک هەڵپڕژان، تێک هەڵچڕژان «هەژار، *چوار ناملکە*»› ☰ گلاویز شدن برای جنگ

**هەڵچڕین** / hełç(i)řîn/: ☜ **هەڵپچڕان**

**ـ هەڵچن** / hełçin/: پاشەوشە. ١. چین لە سەر چین دانەر ٢. ـ هەڵمژ ٣. ـ هەڵگر ☰ ١. برهم چین ٢. مکنده ٣. ـ گزین

**هەڵچناو** / hełç(i)naw/: ☜ **هەڵچنراو**

**هەڵچنران** / hełçinran/: چاوگ. هەڵچنیان: ١. بە سەر یەکدا چنین ٢. *[مەجاز]* چۆڵ و وێران بوون ٣. کۆ کردنەوە؛ جەمەو کردن. بەرانبەر: **داچنران** ٤. بەسران؛ بەر گیران ‹من قەلای شادیم دەوری گیراوە/ دەرگای ژیانم لێ هەڵچنراوە «پیرەمێرد»› ☰ ١. روی هم چیدن ٢. ویران شدن ٣. جمع کردن ۴. مسدود شدن

**هەڵچنراو** / hełçinraw/: ئاوەڵناو. هەڵچناو؛ هەڵچنیاگ: ١. بە سەر یەکدا چنراو ٢. کۆوە کراو ٣. بەسراو ☰ ١. روی هم انباشته ٢. جمع شده ٣. مسدود شده

**هەڵچنک** / hełçinik/: ناو. قاقەزی مەرەکەف هەڵچن ☰ کاغذ خشک‌کن

**هەڵچنیاگ** / hełçinyag/: ☜ **هەڵچنراو**

**هەڵچنیان** / hełçinyan/: ☜ **هەڵچنران**

**هەڵچنین** / hełç(i)nîn/: چاوگ. ١. لە سەر یەک بە بڵندی چنین ٢. هەڵمژین؛ دابردن و نەهێشتنی (ئاوی) شتێ ٣. هەڵبژاردن؛ هەڵگرتنی ئەوەی مەبەستە ☰ ١. روی هم چیدن ٢. مکیدن (آب چیزی را) ٣. برگزیدن

**هەڵچۆ**[1] / hełço/: ئاوەڵناو. ١. هەلاچۆ؛ بە تایبەتمەندی بەرز بوونەوە و لە زیاد کردندا بوون

٢. هەڵــــچوو؛ هەڵــــچووگ؛ هەڵــــبچۆ؛ بـــــە تایبەتمەندی بوونە هەڵم لە تینی ئاساییدا (وەک: ئەلکول، ئیتر و ...) ٣. *[مەجاز]* هەڵچوو؛ تــووڕە؛ زوو زویر بوو ☰ ١. صعودی ٢. فرّار ٣. عصبی

ـ **هەڵچۆ**[٢]: پاشەوشە. ١. بالاکـەر ٢. بـۆ بـەرزایی سەرکەوتوو ٣. سەرەڕۆ ☰ ١. بالنده ٢. صعودکننده ٣. سرخود

**هەڵچۆڕ** / helçoř/: ئاوەڵناو. دژاو؛ لاراو؛ تایبەتمەندی زەوینـێ کـە ئـاو ڕانـاگرێ و دڕدڕ دەبێ ☰ ویژگی زمینی که ناهموار است و آب را بـه خود نمی‌گیرد

**هەڵچۆڕان** / helçořan/: چـاوگ. هەڵــچۆڕیان؛ هەڵچۆڕین؛ تا ئاخر تنۆک ڕژان ‹بێژە: ئەگـەر بـۆ نووسـینی وتـاری پەروەرنـدەی مـن دەریـا هـەموو مەرەکـەف بـێ، بـەر لـە دوایـیپـێهێنـانی وتـاری پەروەرندەی من، بێشک دەریا هەڵدەچۆڕێ تەنانەت گەر هێندەیدیشی دە فریا خەین! «هەژار، *قورئان*»› ☰ تا آخرین قطره چکیدن

**هەڵچۆڕاندن** / helçořandin/: چاوگ. تـا دوامـین تنۆک ڕژاندن ☰ تا آخرین قطره را ریختن

**هەڵچۆڕاو** / helçořaw/: ئاوەڵناو. هەڵـچۆڕیو؛ هـیچ تەڕایی تێدا نەماو ☰ خُشکیده

**هەڵچۆڕیان** / helçořyan/: ☜ هەڵچۆڕان

**هەڵچۆڕین** / helçořîn/: ☜ هەڵچۆڕان

**هەڵچۆڕیو** / helçořîw/: ☜ هەڵچۆڕاو

**هەڵچۆقان** / helçoqan/: ☜ هەڵچۆقین

**هەڵچۆقانـــدن** / helçoqandin/: چـــــاوگ. هەڵچۆقانن: ١. چۆقاندن لە سـەر ئـاگر ٢. لـەرز پێخستن ☰ ١. تفت دادن ٢. به لرز انداختن

**هەڵچۆقانن** / helçoqanin/: ☜ هەڵچۆقاندن

**هەڵچۆقاو** / helçoqaw/: ☜ هەڵچۆقیو

**هەڵچۆقین** / helçoqîn/: چـاوگ. هەڵـچۆقان: ١. چۆقان لە سەر ئاگر ٢. لەرزین: *ئــ)* لـە سـەرمان *ب)* لە بەر نۆبـەتی ☰ ١. تفت خـوردن ٢. لرزیـدن: *الف)* از سرما *ب)* از تب و لرز

**هەڵچۆقیو** / helçoqîw/: ئاوەڵـناو. هەڵـــچۆقاو؛ قاڵ‌کراو ☰ تفیده

**هەڵچوو** / helçû/: ئاوەڵناو. ١. بە دار یان بـە شـاخا سـەرکەوتوو ٢. هــەراش؛ گــەورە بــوو ‹منالـی هەڵچوو› ٣. بڵیند بوو ‹داری هەڵچوو› ٤. *[مەجاز]* سەرەڕۆ؛ بێ ورد بوونەوە و تێـرامان لـە کـاردا ٥. هەڵچۆ؛ هەڵچووگ؛ هەڵـبچۆ؛ بـە تایبەتمەنـدی بوونە هەڵم لە تینی ئاساییدا (وەک: ئەلکول، ئیتر و ...) ٦. سەرڕێژ کردوو ‹شیری هەڵچوو› ٧. *[مەجاز]* هەڵچۆ؛ تووڕە؛ زوو زویر بوو ☰ ١. صـعود کـرده ٢. بالنده ٣. قدکشیده ۴. خودسـر ۵. فـرّار ۶ سـررفته ۷. عصبی

**هەڵچوو ـ پاچوو** / helçû paçû/: ئاوەڵکار. نارێک و بـێسـەرەوبەرە؛ بـە شـپرزی ☰ بـا شـلختگی و بی‌نظمی

**هەڵچوون** / helçûn/: چاوگ. ١. بە لەز بـالا کـردن ‹وا لقی لاولاو بە قەد سەروی ڕەوانا هەڵچووە/ بـۆ لـە باوەش گرتنی بالای بتان وەک پەرچەمە «بێخـود»› ٢. لە بڵندایی سەرکەوتن ‹هەموو ساڵێ بەو شـاخە ڕژدەدا هەڵدەچێ› ٣. پەڕین؛ بوونـە گـاز ‹سـەری شیشەکەی کپ نەکردووە، هەموو ئەلکولەکـەی تێـدا هەڵچووە› ٤. سەرڕێژ کردنی کوڵاو لە سـەر ئـاگر ‹شیرەکە هەڵچوو› ٥. دابوون بۆ بە سەر پشتا بـاز دان ٦. *[مەجاز]* تووڕە بوون ‹کـاکم زوو هەڵـئەچێ› ٧. *[مەجاز]* بەگژا چوون ‹هەڵۆ لە گامێش هەڵـناچێ «مەسەل»› ☰ ١. سریع رشد کردن ٢. از بلندی بـالا رفتن ٣. تصعید شدن ۴. سر رفتن مایع جوشان ۵. خم شدن بـرای پـرش همبـازی ۶ خشـمگین شـدن ۷. پرخاش کردن

**هەڵچوون ـ داچوون** / helçûn daçûn/: نـاو. دۆخـی خواروبان کردنی ئاوی دەریا ☰ جَزر و مد

**هەڵچە / helçe/**: ☜ **هەڵبوژە**

**هەڵچەرخ / helçerx/**: ناو. وەرسووڕ؛ زڤڕ ☗ چرخش

**هەڵچەرخان / helçerxan/**: چاوگ. هەڵچەرخیان؛ هەڵچەرخین؛ وەرسووڕان؛ زڤڕین ☗ ورچرخیدن

**هەڵچەرخاندن / helçerxandin/**: چاوگ. وەرسووڕاندن ☗ ورچرخاندن

**هەڵچەرخیان / helçerx(i)yan/**: ☜ **هەڵچەرخان**

**هەڵچەرخین / helçerxîn/**: ☜ **هەڵچەرخان**

**هەڵچەقان / helçeqan/**: ☜ **هەڵچەقین**

**هەڵچەقاندن / helçeqandin/**: چاوگ. ١. تێڕۆ کردن ٢. دە قوڕ ڕاکردن ☗ ١. خلانیدن ٢. فروکردن

**هەڵچەقاو / helçeqaw/**: ☜ **هەڵچەقیو**

**هەڵچەقین / helçeqîn/**: چاوگ. هەڵچەقان: ١. تێڕۆچوون ‹بە وەم زانی لە باغا چقڵی گوڵ هەڵچەقیە داوێنی/ کە لیرە دڵ لە سینەمدا برینی نەشتەری دیشێ «مەحوی»› ٢. لە قوڕدا چوونە خوار ☗ ١. خلیدن ٢. در گل فرو شدن

**هەڵچەقیو / helçeqîw/**: ئاوەڵناو. هەڵچەقاو؛ چەقیاگ: ١. ڕۆچوو ٢. دە زەوی ڕاکراو ☗ ١. خلیدە ٢. فروشدە در زمین

**هەڵچیچەکان / helçîçekan/**: ☜ **هەڵتروشکان**

**هەڵخران / helx(i)ran/**: چاوگ. هەڵخریان: ١. وە بەر تاو دران بۆ وشک بوونەوە ‹دوێنێ ئێوارێ لەسەربانێ هەڵمخست تووتن/ سروە هات خونچەگوڵی باخی ئەدەب پشکووتن! «هەژار، هێمن، بۆ کوردستان»› ٢. ئاوێزان کران ‹چەن دیلەکانێ هەڵخرا لە من «قانع»› ٣. هەڵدران؛ بەرپا کران ‹لە لایە جامی بادە پڕ کراوە/ لە لایە داری ئیعدام هەڵخراوە «هێمن»› ☗ ١. پهن کردن در آفتاب برای خشک شدن ٢. آویختە شدن ٣. برپا داشتن

**هەڵخراو / helx(i)raw/**: ئاوەڵناو. هەڵخریاگ؛ بەر تاودراو (بۆ وشک بوونەوە) ☗ پهن شدە در آفتاب (برای خشک شدن)

**هەڵخریاگ / helxiryag/**: ☜ **هەڵخراو**

**هەڵخریان / helxiryan/**: ☜ **هەڵخران**

**هەڵخڕان / helx(i)řan/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //هەڵخڕای؛ هەڵدەخڕێی؛ هەڵخڕێ// هەڵخڕیان؛ هەڵخلان: ١. بزوان؛ هەڵتەکانی دەفرێ کە شتی وردی زۆری تێدایە ٢. *[مەجاز]* هانە/ دنە دران ٣. *[مەجاز]* فریو خواردن؛ لە خشتە چوون ☗ ١. تکان خوردن ظرف یا جعبە با محتویات ریز ٢. تحریک شدن ٣. فریب خوردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: هەڵخڕاو/ چاوگی نەرێنی: هەڵنەخڕان

**هەڵخڕاندن / helx(i)řandin/**: چاوگ. تێپەڕ. //هەڵتخڕاند؛ هەڵدەخڕێنی؛ هەڵخڕێنە// هەڵخڕانن؛ هەڵخلاندن؛ هەڵخلانن: ١. تەکان پێ دان و بزواندنی دەفری پڕ لە شتی ورد ‹جەوالی گوێزی هەڵخڕاند› ٢. *[مەجاز]* هان/ دنە دان ‹ئەم قسانە قسەی خۆی نییە، یەقین هەڵیانخڕاندووە!› ٣. *[مەجاز]* فریو دان؛ لە خشتە بردن ‹هێندەیان پەسنی درۆ دا، هەڵیانخڕاند و قوڕیان بە سەریدا کرد!› ٤. لە ناو دەستا خڕ هەڵدان ٥. *[مەجاز]* خستنە بەرکار؛ هێنانە کار ‹تەلەفۆنی هەڵخڕاند: ئەلۆ! ئەلۆ!، مالی ئەفسەر دەست نەکەوت «هەژار، چێشتی مجێور»› ☗ ١. تکان دادن ظرف یا جعبە با محتویات ریز ٢. تحریک کردن ٣. فریب دادن ٤. با دست گرد کردن ٥. بە کار گرفتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: —/ چاوگی نەرێنی: هەڵنەخڕاندن

**هەڵخڕانن / helx(i)řanin/**: ☜ **هەڵخڕاندن**

**هەڵخڕاو / helx(i)řaw/**: ئاوەڵناو. هەڵخڕیاگ: ١. تەکان پێ دراو ٢. *[مەجاز]* هان/ دنە دراو ٣. *[مەجاز]* لە خشتە براو؛ فریو دراو ☗ ١. غلتدادە

شده ۲. فریب خورده ۳. تحریک شده

**هەڵخڕیاگ / hełxiřyag/**: ☜ **هەڵخڕاو**

**هەڵخڕیان / hełxiřyan/**: ☜ **هەڵخڕان**

**هەڵخڕێن / hełx(i)řên/**: ئاوەڵناو. فێتکار؛ دنەدەر؛ هانەدەر ☰ تحریک‌کننده

**هەڵخز / hełxiz/**: ناو. کاری بە خشکە بەرەو ژوور چوون ☰ عمل به بالا خزیدن

**هەڵخزان / hełx(i)zan/**: چاوگ. هەڵخزیان؛ هەڵخزین: ۱. بەرەو ژوور خزان ۲. هەڵخلیسکان ‹بەهارمان خەزان، پا هەڵخزانە/ بۆ نەونەمامان گەلاڕێزانە «پیرەمێرد»› ☰ ۱. به بالا خزیدن ۲. لیز خوردن

**هەڵخزیان / hełxizyan/**: ☜ **هەڵخزان**

**هەڵخزین / hełx(i)zîn/**: ☜ **هەڵخزان**

**هەڵخستن / hełxistin/**: چاوگ. هەرخستن: ۱. بۆ سەرەوە فڕێ دان ‹خشت هەڵخستن بۆ بەنا› ۲. لەگەڵ «گوێ» دەگوترێ بە واتای گوێ ڕاگرتن بۆ بیستن ‹هەر بێنە بەرە و هەڵخول و هاتوچۆیە/ گوێ هەڵخە هەموو دەنگی بژی و ڕۆڕۆیە «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ۳. بەر تاو دان بۆ وشکەوە بوون ‹دەیبەنە سەربان لەوێ هەڵیەخەن/ سفرە بۆ مار و مێروو ڕائەخەن «پیرەمێرد»› ٤. گەڵاڵە کردن و بەرهەم هێنان ‹مبارەکی بێ، خانووەکەی باش هەڵخستووە› ٥. باش سەوز نەبوونی دەغڵ ‹بە هەر بۆنەیەکەوە› ٦. جووتە هاویشتن ۷. هەڵمەقووت کردن؛ بە پەلە خواردن ☰ ۱. به بالا پرتاب کردن ۲. فرادادن (گوش) ۳. پهن کردن در آفتاب ۴. طرح ریختن و ساختن ۵. خوب رشد نکردن غله ۶. جُفتک پراندن ۷. بالا انداختن

**هەڵخستنەوە / hełxist(i)newe/**: چاوگ. ۱. جووتە هاویشتن ‹ئەم هێسترە لەقە هەڵدەخاتەوە› ۲. سەما کردن و خۆ حەوا دان لە خۆشیان ۳. *[کینایە]* تووڕە بوون ☰ ۱. جُفتک پراندن ۲. جست و خیز کردن از شادی ۳. عصبانی شدن

**هەڵخشان / hełx(i)şan/**: چاوگ. هەڵخشیان؛ هەڵخشین؛ هەڵخزان ☰ به بالا خزیدن

**هەڵخشیان / hełxişyan/**: ☜ **هەڵخشان**

**هەڵخشین / hełx(i)şîn/**: ☜ **هەڵخشان**

**هەڵخلاندن / hełx(i)landin/**: چاوگ. هەڵخلانن؛ سووڕ دان و بان و خوار پێ کردنی دەفری پڕ لە شتی ورد (وەک: دانەوێڵە) ☰ تکان دادن ظرف محتوی دانه‌های ریز

**هەڵخلانن / hełx(i)lanin/**: ☜ **هەڵخلاندن**

**هەڵخلیسک / hełx(i)lîsk/**: ناو. جێگەی لووسی سەهۆڵاوی ☰ لیزگاه

**هەڵخلیسکان / hełx(i)lîskan/**: چاوگ. هەڵخلیسکین؛ هەڵزەلین؛ خزین؛ خلیسکان؛ شەمتین ☰ لغزیدن

**هەڵخلیسکاندن / hełx(i)lîskandin/**: چاوگ. خزاندن؛ خلیسکاندن؛ بوونە هۆ بۆ شەمتینی یەکێ ☰ لغزاندن

**هەڵخلیسکاو / hełx(i)lîskaw/**: ئاوەڵناو. شەمتی ☰ لغزیده

**هەڵخلیسکین / hełx(i)lîskîn/**: ☜ **هەڵخلیسکان**

**هەڵخلیسکێن[1] / hełx(i)lîskên/**: ناو. هەڵخلیسکێنە؛ بازی شەمتین ☰ سُرسُره‌بازی

— **هەڵخلیسکێن[2]**: پاشەوشە. هەڵخلیسکێنە ‹پێهەڵخلیسکین› ☰ ـ لغزان

**هەڵخلیسکێنە / hełx(i)lîskêne/**: ☜ **هەڵخلیسکێن**

**هەڵخلەتان / hełx(i)łetan/**: چاوگ. هەڵخەڵەتان؛ خڵەتیان؛ خڵەتان؛ خەڵەتان؛ هەڵفریوان؛ خلافان؛ خلەفان؛ خەلەفان؛ خاپان؛ خاپیان؛ خاپین؛ هەربلین؛ غەرین؛ فریبیان؛ بە فریو چوون؛ لە خشتە چوون؛ دەسخەڕۆ بوون ☰ فریب خوردن

**هەڵخلەتاندن / hełx(i)łetandin/**: چاوگ. خاپاندن؛ هەڵخەڵەتاندن؛ خڵەتاندن؛ هەڵفریواندن؛

خلەفاندن؛ دەسخەڕۆ کردن؛ فریو دان؛ لە خشتە بردن ‹کێ ئێوەی هەڵخەڵەتاند خەیانەت بە گەلەکەتان بکەن؟› 🇮🇷 فریب دادن

**هەڵخلەتاو** / hełx(i)łetaw/: ئاوەڵناو. هەڵخەڵەتاو؛ خلەتیاگ؛ خاپاندی؛ فریودراو؛ دەسخەڕۆ؛ خلەفاو 🇮🇷 فریب‌خورده

**هەڵخلەتێن** / hełx(i)łetên/: ئاوەڵناو. هەڵخلەتێنە؛ هەڵخەڵەتێن؛ هەڵخەڵەتێنە؛ فێڵباز؛ کەلەکباز؛ داوباز؛ خاپینۆک 🇮🇷 فریبکار

**هەڵخلەتێنە** / hełx(i)łetêne/: ☜ هەڵخلەتێن

**هەڵخوراندن** / hełxurandin/: چاوگ. هەڵخوراندن؛ خوراندن لە خوارەوە بۆ سەر ‹کەم لاقت هەڵخورێنە!› 🇮🇷 خاراندن از پایین به بالا

**هەڵخورانن** / hełxuranin/: ☜ هەڵخوراندن

**هەڵخوشان** / hełxuşan/: ☜ هەڵخوشین

**هەڵخوشین** / hełxuşîn/: چاوگ. هەڵخوشان؛ دامالران (وەک: بەن لە سەر چێو) ‹هەرچی بەنەکەی تێ دەهاڵێنم، هەر هەڵدەخوشێ› 🇮🇷 سُر خوردن (مانند: نخ روی چوب)

**هەڵخول** / hełxul/: ناو. ڕەوتی گەڕان و سووڕانی زۆر ‹هەر بێنە بەرە و هەڵخول و هاتوچۆیە/ گوێ هەڵخە هەموو دەنگی بزی و ڕۆڕۆیە «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› 🇮🇷 چرخش بسیار

**هەڵخولان** / hełxulan/: چاوگ. گەڕان و سووڕانی زۆر 🇮🇷 (بسیار) چرخیدن

**هەڵخولاندن** / hełxulandin/: چاوگ. گەڕاندن و سووڕاندن 🇮🇷 (بسیار) چرخاندن

**هەڵخوێندن** / hełx(i)wêndin/: چاوگ. هەڵخۆندن؛ هەڵخۆنن: ١. بە گوێدا خوێندن؛ زۆر نسحەت کردن ٢. بەگژدا چوون؛ پێدا کالان 🇮🇷 ١. در گوش کسی خواندن ٢. شماتت کردن

**هەڵخۆزان** / hełxozan/: ☜ هەڵخۆزتن

**هەڵخۆزانن** / hełxozanin/: چاوگ. هەڵکێشان؛ بۆ بالا کێشان 🇮🇷 به بالا کشیدن

**هەڵخۆزتن** / hełxoztin/: چاوگ. هەڵخۆزان؛ هەڵخۆزین؛ هەڵخۆستن؛ هەڵچوون بەرەو بان 🇮🇷 بالا رفتن

**هەڵخۆزین** / hełxozîn/: ☜ هەڵخۆزتن

**هەڵخۆستن** / hełxostin/: ☜ هەڵخۆزتن

**هەڵخۆندن** / hełxondin/: ☜ هەڵخوێندن

**هەڵخۆنن** / hełxonin/: ☜ هەڵخوێندن

**هەڵخووشان** / hełxûşan/: چاوگ. ١. تێکچوونی کار ‹بە داخەوە کارەکەمان لێ هەڵخووشا› ٢. بەرپەرچ دانەوە؛ بە دەمدا چوونەوە؛ وەرنەگرتن و دانە دواوەی قسەی کەسێک 🇮🇷 ١. خراب شدن کار ٢. رد کردن گفتار کسی

**هەڵخە** / hełxe/: ناو. جۆرێک هەڵپەڕکێی کوردی، هەر لە جێوە هەڵدەخەنەوە 🇮🇷 نوعی رقص کُردی

**هەڵخەڵەتان** / hełxełetan/: ☜ هەڵخلەتان

**هەڵخەڵەتاندن** / hełxełetandin/: ☜ هەڵخلەتاندن

**هەڵخەڵەتاو** / hełxełetaw/: ☜ هەڵخلەتاو

**هەڵخەڵەتێن** / hełxełetên/: ☜ هەڵخلەتێن

**هەڵخەڵەتێنە** / hełxełetêne/: ☜ هەڵخلەتێن

**هەڵخەوداخە** / hełxe w daxê/: ☜ هەڵبەز - دابەز

**هەڵداریان** / hełdaryan/: چاوگ. داریانەوە 🇮🇷 چپه شدن

**هەڵداشتن** / hełdaştin/: چاوگ. هەڵدێران؛ هەڵدێران؛ لە بەرزەوە فڕێ دان ‹کوشتمی و شەش خانی ئومێدی لە من گرتن حەریف/ مۆرە هەڵداوێم و بێهوودە بە هیوای دووشەشم «هێمن»› 🇮🇷 انداختن (از بالا)

**هەڵدان** / hełdan/: چاوگ. ١. بەرەو بالا فڕێ دان ٢. بەرەو حەوا کردن ‹بادەوە هەڵدان› ٣. بلند کردن و دامەزراندن (وەک چادر و...) ‹ڕەشماڵیان

هەڵـدا› ٤. پـێ‌هەڵـگوتن؛ پەسـن دان ‹تاقمێـک کاریان هەڵدانە بە باڵای دەسەڵاتدا و بەس!› ٥. قسە دەست پێ‌کردن ‹لە جوابدا هەڵـیدایە: ...› ٦. لـە تراوێ ڕاکـردن ‹ئـەو دەفـرە دەئـاوی هەڵـدە!› ٧. تێ‌وەردان (وەک: ئاو لە دەفر) ٨. یـەک لـە دووی یەک گـوتن (نـاو) ‹زۆرێ ناویـان هەڵـداوە دەڵـێن شۆفارن› ٩. گەشە کردن ‹ماشەڵڵا شیناوەردەکەت باش هەڵی‌داوە› ١٠. پایە بەرز بوون ‹کابرا تا دوێنێ کـەس نەیدەناسـی ئێسـتا وا هەڵـی‌داوە› ١١. بـەرز کردنـەوە (وەک: هەڵـگرتنی بـار و خسـتنیە سـەر بارەبەر) ‹وەرە ئـەو دوو تـا گەنمـە هەڵـدەینە سـەر هێسـترەکە!› ١٢. هەڵـێنان؛ زانـینی مەتەڵـۆک ‹ئافـەرین! ئـەم مەتەڵـۆکەت بـاش هەڵـدا› ١٣. دەرکەوتن ‹مانگ ئەوا تازە لە ئاسۆ هەڵدێ/ کۆمەڵێ هەورەسپێلکەی بەردێ «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ١٤. با کردنە ناو؛ فوو دان ‹گووپت هەڵدە!› ١٥. لێ‌دان ‹شەق هەڵدان› 🇮🇷 ١. بـە بـالا پـرت کـردن ٢. هـوا کردن ٣. برپا کردن (چادر و ...) ۴. سـتایش کـردن ۵. سـخن آغـاز کـردن ۶. برکشـیدن ۷. گردانـدن ۸ برشمردن ۹. شـکوفا شـدن ۱۰. ترقـی کـردن ۱۱. از زمین کندن ۱۲. چیستان و معما را حل کردن ۱۳. سر برآوردن ۱۴. دمیدن ۱۵. زدن (تیپا)

**هەڵدانەوە / heɫdanewe/**: چـاوگ. هەڵـۆدان؛ هەڵـەودان: ١. بـەرەو ژوور بـردن ‹پەنجەرەکـە هەڵـدەوە؛ دیسـان پـەردەی هەڵـداوە› ٢. شـین بوونەوە دوای بـڕین ‹وێنجەکـە هەڵـیداوەتەوە› ٣. سەرهەڵدانەوە؛ گەڕانەوە (نەخۆشی) ‹شێرپەنجەی دوابڕاو عیلاجـی نایـە، هەڵـدەداتەوە› ٤. دیسـانەوە دەرکـەوتن و درێـژە پـێ دان ‹سـەرلەنوێ هەڵیداوەتەوە و ماڵەکەی دەوێتەوە› ٥. ژێر هێنانـە ڕوو ‹هەموو دەشتەکەی بۆ گـەنج هەڵـداوە› ٦. بـە سـەر یەکـدا کـردن ‹گەنمەکـەی لـە لایـەک هەڵدابووەوە› ٧. لاپەڕە دانەوە؛ گۆڕانی لاپەڕە ‹با پەڕەکانی هەڵـداوە› ٨. *[مەجاز]* ئـاڵوگـۆڕ کـردنی بارودۆخ ‹شۆڕشی خەڵک پەڕەیەکی‌تـری لـە مێـژوو هەڵداوە› 🇮🇷 ١. بالا زدن ٢. دوبـاره رویـیدن ٣. عـود کردن (بیماری) ۴. از سر گرفتن ۵. زیر و رو کـردن ۶ بر هم انباشتن ۷و۸ ورق خوردن

**هەڵدران / heɫd(i)ran/**: چـاوگ. هەڵـدریان: ١. بڵند کران و دامەزران؛ بەرپا کران ‹لە دەشت و بەر پەساران هەڵدراون چادر و ڕەشماڵ/ نەما بێگانە تاکوو جێژنەمان لێ تاڵ بکا ئەو ساڵ «هێمن»› ٢. لێ‌دران بە شەق یان شاخ و ... ‹تا سەر نەبۆتـە گـۆ، دە لـە دنیا ئەتۆ شەقێ/ هەر ئەم شەقە بە کارە کەوا هەڵدرێ لە هیچ «مەحوی»› 🇮🇷 ١. برپا شدن ٢. زده شدن

**هەڵدرانەوە / heɫd(i)ranewe/**: چـاوگ. هەڵدریانەوە؛ وەلا دران ‹پـەردەکان هەڵـدرانەوە و ژوورەکە رووناک بۆوە› 🇮🇷 کنار زده شدن

**هەڵدراو / heɫd(i)raw/**: ئاوەڵناو. هەڵدریاگ؛ بەرپا؛ ڕاستەوکراو 🇮🇷 برپا شده

**هەڵدراوە / heɫd(i)rawe/**: ئاوەڵناو. ١. بەسەر یەکا کۆوە کراو ٢. وەلا دراو 🇮🇷 ١. برهم انباشته شده ٢. کنار زده شده

**هەڵدروان / heɫdirwan/**: چـاوگ. هەڵـدووران؛ هەڵدووریان؛ هەڵدووریانن؛ تەقـەڵ درانی قـەراغ 🇮🇷 دوخته شدن کنارەها

**هەڵدرواندن / heɫdirwandin/**: ☜ هەڵدروون

**هەڵدرواو / heɫdirwaw/**: ئاوەڵـناو. هەڵـدووراو؛ هەڵدووریاگ؛ تەقەڵدراو لـە کـەنارەوە 🇮🇷 دوختـه شده در کنارەها

**هەڵدروو / heɫd(i)rû/**: ناو. هەڵدوور؛ تەقەڵی قەراغ 🇮🇷 بخیەی کنارەها

**هەڵدروون / heɫd(i)rûn/**: چـاوگ. هەڵـدرواندن؛ هەڵدووران؛ هەڵدوورین؛ درووونی کەناری شتێ 🇮🇷 دوختن کنارەها

**هەڵدریاگ / heɫdiryag/**: ☜ هەڵدراو

**هەڵدریان / heldiryan/:** ☜ **هەڵدران**

**هەڵدریانەوە / heldiryanewe/:** ☜ **هەڵدرانەوە**

**هەڵدڕان / held(i)řan/:** چاوگ. تەواو دڕان ☰ جر خوردن

**هەڵدڕاو / held(i)řaw/:** ئاوەڵناو. هەڵدڕیاگ؛ جڕبردوو؛ دڕاو ‹کارتۆنی هەڵدڕاو› ☰ جرخورده

**هەڵدڕاوە / held(i)řawe/:** ناو. هەڵدڕاوی؛ دڕاوی؛ دڕیاگی؛ شوێنی دڕاوی ‹لە خوار هەڵدڕاوەکەوە بیدوورەوە!› ☰ پارگی

**هەڵدڕاوی / held(i)řawî/:** ☜ **هەڵدڕاوە**

**هەڵدڕ • هەڵدڕ / heldiř heldiř/:** ئاوەڵناو. زۆر دادڕاو ‹سێلاو زەوییەکەی هەڵدڕ ـ هەڵدڕ کرد› ☰ پاره ـ پاره

**هەڵدڕیاگ / heldiřyag/:** ☜ **هەڵدڕاو**

**هەڵدڕین / held(i)řîn/:** چاوگ. هەڵۆدڕین؛ تەواو دڕین ‹سا بێ زگی خۆت هەڵمەدڕە و مەمرە لە داخا/ ئەم قەومە هەموو مردن و تۆ مای لە وەجاخا! «شێخ ڕەزا»› ☰ پاره کردن؛ بردریدن

**• هەڵدڕێن / held(i)řên/:** پاشەوشە. زۆر لە دڕیندا لێهاتوو ‹خەنجەری سینگهەڵدڕێن› ☰ بردرنده

**هەڵدوور / heldûr/:** ☜ **هەڵدرو**

**هەڵدووران / heldûran/:** ☜ **هەڵدروان**

**هەڵدوورانن / heldûranin/:** ☜ **هەڵدروون**

**هەڵدووراو / heldûraw/:** ☜ **هەڵدرواو**

**هەڵدووریاگ / heldûryag/:** ☜ **هەڵدرواو**

**هەڵدووریان / heldûryan/:** ☜ **هەڵدروان**

**هەڵدوورین / heldûrîn/:** ☜ **هەڵدروون**

**هەڵدەر / helder/:** ئاوەڵناو. بتر؛ هەراش؛ بە خۆداهاتوو ☰ رشید؛ بالنده

**هەڵدێر[1] / heldêr/:** ناو. ١. ئاوەهەڵدێر؛ تافگە ٢. جێگەی زۆر بەرز و قیت لە شاخ و کێودا ☰ ١. آبشار ٢. پرتگاه

**• هەڵدێر[2]:** پاشەوشە. لە سەرەوە بەرەوخوار ڕژێن ‹ئاوەهەڵدێر› ☰ از بالا ریزنده

**هەڵدێران / heldêran/:** چاوگ. ١. هەڵدێریان؛ لە بەرزییەوە فڕێ دران بۆ خوار ‹زۆری زۆردار کە سەرێک پێو وێران/ بە ملی وردەوە لێو هەڵدێران «هەژار، ئاڵەکۆک»› ٢. هەڵداشتن؛ لە بەرزەوە بۆ خوار خستن ☰ ١. پرت شدن از بالا ٢. انداختن از بالا

**هەڵدێراو / heldêraw/:** ئاوەڵناو. هەڵدێریاگ: ١. لە بالاوە کەوتوو ٢. کەوتوو؛ وەلادا هاتوو ☰ ١. پرت شده از بالا ٢. دراز افتاده

**هەڵدێرکە / heldêrke/:** ☜ **هەڵدێرگە**

**هەڵدێرگە / heldêrge/:** ناو. هەڵدێرکە؛ جێگەی زۆر سەخت کە مرۆی لێ دەکەوێ ☰ پرتگاه

**هەڵدێریاگ / heldêryag/:** ئاوەڵناو. ١. ☜ **هەڵدێراو** ٢. کەوتوو ☰ ١. ☜ **هەڵدێراو** ٢. افتاده

**هەڵدێریان / heldêryan/:** چاوگ. ١. ☜ **هەڵدێران ـ١** ٢. کەوتن ☰ ١. ☜ **هەڵدێران ـ١** ٢. افتادن

**هەڵڕژان / helř(i)jan/:** چاوگ. هەڵڕژیان؛ بەرەوخوار ڕژان ‹لەو هەورە هەڵڕژێ بە ئەبەد لێزمەی سەلات/ لە قەبر و جیسم و ڕۆحی نەبی ئاخروززەمان «مەحوی»› ☰ فرو ریختن

**هەڵڕژاندن / helř(i)jandin/:** چاوگ. هەڵڕژانن؛ هەڵڕژتن؛ هەڵڕشتن: ١. لە سەرەوە بۆ خوار ڕژاندن ٢. *[مەجاز]* زووخاو هەڵهاوردنەوە؛ کوڵ و دەردی دەروون دەبڕین ☰ ١. فرو ریختن ٢. درددل کردن

**هەڵڕژانن / helř(i)janin/:** ☜ **هەڵڕژاندن**

**هەڵڕژاو / helř(i)jaw/:** ئاوەڵناو. هەڵڕژیاگ؛ ڕژاو بەرەو خوار ☰ فروریخته

**هەڵڕژتن / helřijtin/:** ☜ **هەڵڕژاندن**

**هەڵڕژیاگ / helřijyag/:** ☜ **هەڵڕژاو**

**هەڵڕژیان / helřijyan/:** ☜ **هەڵڕژان**

**هەڵڕشتن / helřiştin/**: ☜ هەڵڕژاندن

**هەڵڕوانین / helř(i)wanîn/**: چاوگ. لە خوارەوە بۆ سەرەوە تەماشا کردن ▤ از پایین به بالا نگاه کردن

**هەڵڕۆسکان / helřoskan/**: چاوگ. هەڵزنان؛ هەڵچوون بە قەدی شاخ و دار و ڕەوەزدا ▤ صعود کردن

**هەڵڕووشان / helřûşan/**: چاوگ. هەڵڕووشیان: ١. ڕووشان؛ ڕووش بردن ٢. تێکچوون؛ هەڵخووشان ▤ ١. خراش برداشتن ٢. به هم ریختن

**هەڵڕووشاندن / helřûşandin/**: چاوگ. هەڵڕووشانن: ١. ڕووشاندن ٢. تێکدانی کار ▤ ١. خراشیدن ٢. به هم ریختن

**هەڵڕووشانن / helřûşanin/**: ☜ هەڵڕووشاندن

**هەڵڕووشاو / helřûşaw/**: ئاوەڵناو. هەڵڕووشیاگ: ١. ڕووشاو ٢. تێکدراو ▤ ١. خراشیده ٢. بەهم ریخته

**هەڵڕووشیاگ / helřûşyag/**: ☜ هەڵڕووشاو

**هەڵڕووشیان / helřûşyan/**: ☜ هەڵڕووشان

**هەڵڕیان / helř(i)yan/**: چاوگ. بە پەلە ڕیان ▤ عجله ریدن

**هەڵز / helz/**: ناو. ١. هلز؛ چەقک؛ چەخشوور؛ گیایەکی بەناوبانگی گەڵا دەرزییە لە تیرەی کەما و لۆیە بۆ دەرمان دەشێ لە چێشت دەکرێ و لەوەڕی چاکە ٢. قەت؛ وێنجە ▤ ١. گیاهی است برگ سوزنی با مصرف دارویی و خوراکی ٢. یونجه

⊡ **هەڵز بەهێن**: سیس هەڵگەڕان و زەرد بوونی وێنجە ▤ زرد و پژمرده شدن یونجه

**هەڵزبڕ / helzbiř/**: ناو. کاتی دروێنەی وێنجە ▤ موسم درو یونجه

**هەڵزران / helz(i)ran/**: چاوگ. هەڵزریان؛ پڕ لە زیپکە بوون (پێست) ▤ جوش‌جوشی شدن (پوست)

**هەڵزرنگان / helz(i)ringan/**: چاوگ. هەڵزرنگیان: ١. هانە دران؛ دنە دران ٢. شڵەژان؛ شێوان و سەر لێ تێکچوون ▤ ١. تحریک شدن ٢. آشفته شدن

**هەڵزرنگاندن / helz(i)ringandin/**: چاوگ. هەڵزرنگانن؛ هانەدان؛ دنەدان ▤ تحریک کردن

**هەڵزرنگانن / helz(i)ringanin/**: ☜ هەڵزرنگاندن

**هەڵزرنگیان / helz(i)ring(i)yan/**: ☜ هەڵزرنگان

**هەڵزریاگ / helziryag/**: ئاوەڵناو. هەڵزریاو؛ هەڵپشکووتوو؛ وردەجۆشی زۆر دەرکردوو ▤ جوش‌جوشی شده

**هەڵزریان / helziryan/**: ☜ هەڵزران

**هەڵزریاو / helziryaw/**: ☜ هەڵزریاگ

**هەڵزڕان / helz(i)řan/**: چاوگ. هەڵزڕیان؛ دادڕان؛ دادڕیان ▤ بردریده شدن

**هەڵزڕاندن / helz(i)řandin/**: چاوگ. هەڵزڕانن؛ دڕاندن ▤ بردریدن

**هەڵزڕانن / helz(i)řanin/**: ☜ هەڵزڕاندن

**هەڵزڕاو / helz(i)řaw/**: ئاوەڵناو. دڕاو؛ دڕیاگ ▤ دریده

**هەڵزڕەپان / helz(i)řepan/**: ☜ هەڵتۆقین

**هەڵزڕیان / helziřyan/**: ☜ هەڵزڕان

**هەڵزڵەپان / helz(i)łepan/**: چاوگ. هەڵزڵەپین؛ پۆرگ دەرکردنی پێست ▤ تاول زدن

**هەڵزڵەپین / helz(i)łepîn/**: ☜ هەڵزڵەپان

**هەڵزنین / helz(i)nîn/**: چاوگ. هەڵچوون بەرەو بالا ▤ بالارفتن سوی بلندی

**هەڵزووران / helzûran/**: چاوگ. سووتانی وەک تویی سەرەوەی گۆشت ▤ سوختن سطحی گوشت

**هەڵزەپەتان / helzepetan/**: ☜ هەڵتۆقین

**هەڵزەقانەوە / helzeqanewe/**: ☜ هەڵزەقینەوە

**هەڵزەقینەوە / helzeqînewe/**: چاوگ. هەڵزەقانەوە؛ هەڵژقین؛ هەڵبەزینەوە لە ترس و

لەنکاو ☰ از جا پریدن

**هەڵزەڵین / hełzełîn/**: ☜ **هەڵخلیسکان**

**هەڵزیپان / hełzîpan/**: ☜ **هەڵتۆقین**

**هەڵژڤین / hełj(i)vîn/**: ☜ **هەڵزەقینەوە**

**هەڵژلێویان / hełj(i)łêwyan/**: چاوگ. ١. پشێوی ڕوو دان ٢. دڵ تێکچوون و شڵەژان ☰ ١. آشوب برپا شدن ٢. دل به هم آمدن

**هەڵژمار / hełj(i)mar/**: ناو. سەرژمێری ☰ سرشُماری

**هەڵژماردن / hełj(i)mardin/**: چاوگ. ١. هەڵبژاردن ٢. سەرژمار کردن ☰ ١. برگُزیدن ٢. سرشماری کردن

**هەڵژماردو / hełj(i)mardû/**: ☜ **هەڵژماردە**

**هەڵژماردە / hełj(i)marde/**: ئاوەڵناو. هەڵژماردوو؛ هەڵژمێراو: ١. هەڵبژێراو ٢. ژمێردراو ☰ ١. برگُزیده ٢. برشُمرده

**هەڵژماری / hełj(i)marî/**: ناو. سەرژمێری؛ سەرژماری ☰ سرشُماری

**هەڵژمێر / hełj(i)mêr/**: ئاوەڵناو. ١. هەڵبژێر ٢. بژمێر ☰ ١. برگُزیننده ٢. شُمارشگر

**هەڵژمێران / hełj(i)mêran/**: چاوگ. وە بەر هەڵژماردن کەوتن ☰ برشُمرده شدن

**هەڵژمێراو / hełj(i)mêraw/**: ☜ **هەڵژماردە**

**هەڵس / heł(i)s/**: ناو. هەڵست؛ کاری هەڵسان ☰ عمل برخاستن

**هەڵسان / hełsan/**: ☜ **هەڵستان**

**هەڵساندن / hełsandin/**: ☜ **هەڵستاندن**

**هەڵساندنەوە / hełsand(i)newe/**: چاوگ. هەستاندنەوە؛ هۆرزنایوە ☰ برخیزاندن

**هەڵسانن / hełsanin/**: ☜ **هەڵستاندن**

**هەڵسانەوە / hełsanewe/**: چاوگ. ١. دوای کەوتن یا نیشتنەوە ڕاست بوونەوە ‹کەوتم و هەڵنەسامەوە/ تێکییەوە پێچامەوە! «پیرەمێرد»› ٢. [مەجاز] لە نەخۆشی چا بوونەوە ☰ ١. دوبارە برخاستن ٢. بهبود یافتن

**هەڵساوین / hełsawîn/**: چاوگ. ساوین؛ پێدا مالین ☰ مالیدن

**هەڵسپاردن / hełs(i)pardin/**: ☜ **هەڵپەساردن**

**هەڵسپێران / hełs(i)pêran/**: ☜ **هەڵپەسێران**

**هەڵسپێراو / hełs(i)pêraw/**: ☜ **هەڵپەسێراو**

**هەڵسپێریاگ / hełs(i)pêryag/**: ☜ **هەڵپەسێراو**

**هەڵسپێریان / hełs(i)pêryan/**: ☜ **هەڵپەسێران**

**هەڵست / hełist/**: ☜ **هەڵس**

**هەڵستان / hełistan/**: چاوگ. تێنەپەر. //هەڵستای؛ هەڵدەستی؛ هەڵستە// هەڵسان؛ هەستان: ١. ڕاستەوە بوون ٢. لە لان دەرچوونی نێچیر ٣. بەرز بوونەوەی ڕادەی ئاو ٤. لە خەو بێدار بوونەوە ‹موسڵمانان لە خەو هەستن ئەوا وەختی هەڵستانە/ تەماشای فەجری سادیق کەن لە ئاسمانا چراخانە «عاسی»› ٥. بەرز بوونەوە بۆ هەوا (وەک فڕۆکە و مەل و...) ☰ ١. برخاستن ٢. از مخفیگاه در رفتن شکار ٣. بالا آمدن سطح آب ٤. از خواب برخاستن ٥. بلند شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: هەڵستاو/ چاوگی نەرێنی: هەڵنەستان

**هەڵستاندن / hełistandin/**: چاوگ. تێپەر. //هەڵتساند؛ هەڵدەستێنی؛ هەڵستێنە// هەڵساندن؛ هەڵسانن: ١. ڕاستەوە کردن ٢. لە لان دەرخستن ‹ئێستا مەجالەتی، خێڵ بەرەو ژێرە و دەست لێکبەردانێ/ هەڵمدەستاند شینکێ، مات و مەلوولێ ماڵوێران بە سەر شینکم هەڵبوارد ... «پایزە»› ٣. خەوەر کردنەوە؛ لە خەو بێدار هەستاندن ☰ ١. برخیزاندن ٢. از لانه خارج کردن شکار ٣. بیدار کردن

■ ئاوەڵناوی‌بەرکاری: ـ/ چاوگی‌نەرێنی: هەڵنەستاندن

**هەڵستاندنەوە / hełistand(i)newe/**: چاوگ.

دوای کەوتن یا نیشتن ڕاست کردنەوە ☰ دوبارە سرپا کردن

**هەڵستاو / heɫistaw/**: ئاوەڵناو. ڕاست؛ ڕاس؛ قنج ☰ ایستاده

**هەڵسڕین / heɫs(i)ř̂în/**: چاوگ. هەڵلووشینەوە (وەک: چڵم لە کەپۆدا) ☰ بالا کشیدن (مانند: آب بینی)

**هەڵسکاندن / heɫs(i)kandin/**: ئاوەڵناو. جنێو دان؛ سخێف گوتن ☰ دُشنام دادن

**هەڵسکانن / heɫs(i)kanin/**: چاوگ. بەر جوێن دان و خراو گوتن ☰ زیر دُشنام گرفتن

**هەڵسڵەماندنەوە / heɫs(i)ɫemand(i)newe/**: چاوگ. ڕەواندنەوە؛ دەرپەڕاندنەوە؛ ترساندن و تاراندنەوە ☰ رم دادن

**هەڵسڵەمانەوە / heɫs(i)ɫemanewe/**: چاوگ. هەڵسڵەمینەوە؛ سڵەمانەوە؛ ڕەو کردن ☰ رم کردن

**هەڵسڵەمینەوە / heɫs(i)ɫemînewe/**: ☜ هەڵسڵەمانەوە

**هەڵسوان / heɫs(i)wan/**: ☜ هەڵسون

**هەڵس و کەوت / heɫs û kewt/**: ناو. ١. هامشۆ؛ هاموشۆ؛ پێوەندی ‹لەگەڵ مرۆی باش هەڵس‌وکەوتت بێ!› ٢. ئاکار؛ شێوە؛ ڕەوش ‹هەڵس‌وکەوتی لەگەڵ خەڵکدا زۆر باشە› ٣. کەندولەند؛ خاس و خراپ لە ڕەوتێکدا ‹ژیان هەڵس‌وکەوتی زۆرە› ☰ ١. نشست و برخاست ٢. رفتار ٣. اُفت‌وخیز

**هەڵسووڕان / heɫsûřan/**: چاوگ. هەڵسووڕیان؛ هەڵسووڕین: ١. سووڕان؛ خولانەوە ٢. بزووتن؛ جوولانەوە ٣. [کینایە] بەڕێوە چوون ☰ ١. چرخیدن ٢. تحرک داشتن ٣. اداره شدن

**هەڵسووڕاندن / heɫsûřandin/**: چاوگ. ١. سووڕ دان؛ خول دان ‹تاولەمە هەڵسووڕاندن› ٢. [کینایە] کار و بار گەڕاندن؛ بەڕێوە بردن ‹مام حەسەن کار و باری ئاغا هەڵدەسووڕێنێ› ☰ ١. چرخاندن ٢. اداره کردن

**هەڵسووڕاو / heɫsûřaw/**: ئاوەڵناو. ١. خول‌دریاگ؛ سووڕدراو ٢. [کینایە] بەکار و تێکۆشەر ‹پیاوێکی هەڵسووڕاوە› ☰ ١. چرخیده ٢. پرتحرک؛ فعال

**هەڵسووڕ ـ داسووڕ / heɫsûř dasûř/**: ناو. ١. خول و سووڕ ٢. ڕەوتی بزووتن؛ تێکۆشان ‹ئەم هەموو هەڵسووڕ ـ داسووڕەت لە چییە؟› ☰ ١. چرخش ٢. تلاش

**هەڵسووڕیان / heɫsûřyan/**: ☜ هەڵسووڕان

**هەڵسووڕین / heɫsûřîn/**: ☜ هەڵسووڕان

**هەڵسووڕێن[1] / heɫsûřên/**: ناو. [کینایە] بەڕێوەبەر ☰ مُدیر

• **هەڵسووڕێن[2]**: پاشەوشە. خول و سووڕ بە شتێ دەر ‹کارهەڵسووڕێن› ☰ ـ چرخان

**هەڵسون / heɫsûn/**: چاوگ. هەڵسوان؛ پیاساوین ‹مەڵحەمی تێ‌هەڵسووم؛ قورم تێ‌هەڵسوو› ☰ اندودن؛ مالیدن

**هەڵسەنگان / heɫsengan/**: چاوگ. ١. بەراورد کرانی کێش ٢. [کینایە] ئەزموون و نرخ بۆ دانران ☰ ١. وزن شدن ٢. ارزیابی شدن

**هەڵسەنگاندن / heɫsengandin/**: چاوگ. هەڵسەنگانن: ١. کێشان؛ لە تەرازوو دان ٢. بەراورد کردن؛ نرخ بۆ دیاری کردن ☰ ١. وزن کردن ٢. ارزیابی کردن؛ سنجیدن

**هەڵسەنگانن / heɫsenganin/**: ☜ هەڵسەنگاندن

**هەڵسەنگێنران / heɫsengênran/**: چاوگ. بەراورد کردن؛ بایەخ و سەنگینی شتێ دیاری کردن ☰ ارزیابی شدن

**هەڵسەنگێنراو / heɫsengênraw/**: ئاوەڵناو. ئازموودە؛ ئەزموو ☰ آزموده

**هەڵسیاگ / heɫs(i)yag/**: ئاوەڵناو. ١. لەسەرپێ؛

سەرپا ٢. هەڵتۆقیو؛ هەڵتۆقاو ☰ ١. ایستاده ٢. برآمده

**هەڵشاخان / helşaxan/**: ☜ **هەڵشاخاندن**

**هەڵشاخاندن / helşaxandin/**: چاوگ. هەڵشاخان؛ هەڵشاخین؛ بە سەردا نەڕاندن ‹نازانی چۆن بە سەرمدا هەڵی‌شاخاند› ☰ بر سر کسی فریاد کشیدن

**هەڵشاخین / helşaxîn/**: ☜ **هەڵشاخاندن**

**هەڵشاندن / helşandin/**: چاوگ. ١. ڕماندن؛ ڕووخاندن ٢. هەڵوەشاندن؛ لێک کردنەوە ٣. شێواندن؛ تێکدان ٤. *[کینایە]* پاشگەز بوونەوە ☰ ١. ویران کردن ٢. از هم باز کردن ٣. برهم زدن ۴. پشیمان شدن

**هەڵشکاو / helş(i)kaw/**: ئاوەڵناو. تێشکاو ☰ ورشکسته

**هەڵشکیان / helşikyan/**: چاوگ. تێشکان؛ نابووت بوون ☰ ورشکست شدن

**هەڵشڵنگاندن / helş(i)łingandin/**: ☜ **هەڵشڵینگاندن**

**هەڵشڵەپاندن / helş(i)łepandin/**: ☜ **هەڵپشاوتن**

**هەڵشڵەپین / helş(i)łepîn/**: چاوگ. لە ئاودا هەڵبەزینەوە ☰ جست و خیز کردن در آب

**هەڵشڵیپان / helş(i)łîpan/**: چاوگ. شڵپە لێ هێنان لە نێو ئاودا ☰ آب را به هر سو پاشیدن

**هەڵشڵینگاندن / helş(i)łîngandin/**: چاوگ. هەڵشڵنگاندن؛ هەڵشنگاندن؛ خۆ هەڵکێشانی بە درۆ ☰ لاف زدن

**هەڵشماردن / helş(i)mardin/**: چاوگ. دانە دانە باس کردن ☰ برشُمردن

**هەڵشنگاندن / helşingandin/**: ☜ **هەڵشڵینگاندن**

**هەڵشنگڵاندن / helş(i)înglandin/**: چاوگ. هەڵتەکاندن؛ ڕاتلەکاندن بۆ بان و خوار ☰ تکاندن

**هەڵشوولان / helşûlan/**: ☜ **هەڵشوولاندن**

**هەڵشوولاندن / helşûlandin/**: چاوگ. *[شوورەیی]* هەڵشوولان؛ فیراندن؛ زگ‌چوون؛ گووی شل کردن ☰ اسهالی ریدن

**هەڵشەپاندن / helşepandin/**: ☜ **هەڵپشاوتن**

**هەڵشێلان / helşêlan/**: چاوگ. شێلان و پشاوتن ☰ به هم زدن و چلاندن

**هەڵشێوان / helşêwan/**: چاوگ. هەڵشێویان: ١. لێک دران و تێکەڵ پێکەڵ بوون ٢. دڵ تێکچوون ☰ ١. آشفتن ٢. دل به هم آمدن

**هەڵشێواندن / helşêwandin/**: چاوگ. هەڵشێوانن: ١. لێکدان و تێکەڵ کردن ٢. بوونە هۆی دڵ تێکچوون ☰ ١. آشفته کردن؛ بر هم زدن ٢. دل به هم زدن

**هەڵشێوانن / helşêwanin/**: ☜ **هەڵشێواندن**

**هەڵشێواو / helşêwaw/**: ئاوەڵناو. هەڵشێویاگ: ١. تێکەڵ پێکەڵ ٢. دڵ‌تێکچوو ☰ ١. آشفته ٢. دل به هم آمده

**هەڵشێویاگ / helşêwyag/**: ☜ **هەڵشێواو**

**هەڵشێویان / helşêwyan/**: ☜ **هەڵشێوان**

**- هەڵشێوێن / -helşêwên/**: پاشوشە. تێکدەر ‹دڵ‌هەڵشێوێن› ☰ برهم‌زن

**هەڵفرتان / helfirtan/**: چاوگ. هەڵفرتیان؛ دەرپەڕین؛ قوشقی بوون و ڕاکردن ☰ رمیدن و گُریختن

**هەڵفرتاندن / helfirtandin/**: چاوگ. هەڵفرتانن؛ دەرپەڕاندن؛ وەدەرنان؛ دەرکردن ‹مشکی لە ماڵ هەڵفرتاند› ☰ راندن

**هەڵفرتانن / helfirtanin/**: ☜ **هەڵفرتاندن**

**هەڵفرتیان / helfirt(i)yan/**: ☜ **هەڵفرتان**

**هەڵفرچکین / helfirç(i)kîn/**: ☜ **هەڵفڕین**

**هەڵفریوان / helf(i)rîwan/**: چاوگ. خاپین؛ خاپان؛ هەڵخلەتان؛ هەڵخەڵەتان؛ خلافیان ☰ فریب خوردن

**هەڵفریواندن / hełf(i)rîwandin/**: چاوگ. هەڵفریوانن؛ خاپاندن ‹بەم ریش و کشوفشەوە خەڵک هەڵمەفریوێنە!› ☰ فریب دادن

**هەڵفریوانن / hełf(i)rîwanin/**: ☜ هەڵفریواندن

**هەڵفڕ / hełfiř/**: ناو. کاری فڕین؛ باڵ گرتنەوە ☰ پرواز

**هەڵفڕان / hełf(i)řan/**: ☜ هەڵفڕین

**هەڵفڕاندن / hełf(i)řandin/**: چاوگ. هلفڕاندن؛ هەڵفڕانن؛ باڵ پێگرتنەوە ‹بە باڵی خەیاڵ بە لاف و گەزاف/ هەڵمان ئەفڕێنن بۆ سەر کێوی قاف «پیرەمێرد»› ☰ پرواز دادن

**هەڵفڕانن / hełf(i)řanin/**: ☜ هەڵفڕاندن

**هەڵفڕاو / hełf(i)řaw/**: ئاوەڵناو. هەڵفڕیو؛ فڕیو ‹ئەی بازی سیروە تۆ بی خودا بۆچی ناگری/ نێچیرەکەت کە پۆڕی دڵی هەڵفڕاومە «بێخود»› ☰ بە پرواز درآمده

**هەڵفڕ ـ هەڵفڕ / hełfiř hełfiř/**: ناو. هەڵفڕینی ناتەواو و ناوبەناو ‹بوو بە جیکەجیک و فیکە نیشتن/ بە هەڵفڕ ـ هەڵفڕ خۆ هەڵاویشتن «حەقیقی»› ☰ عمل یا حالت پر پر زدن

**هەڵفڕین / hełf(i)řîn/**: چاوگ. هلفڕین؛ هەڵفڕچکین؛ هەڵفڕان؛ فڕین؛ باڵ گرتنەوە ‹خەلاسی بوونی قەت ناوێ ئەسیری زوڵفی زنجیرت/ لە بەر تیرت، مەلەک بێ هەڵفڕینی نەبووە نەخچیرت «مەحوی»› ☰ پرواز کردن

**هەڵفڕیو / hełf(i)řîw/**: ☜ هەڵفڕاندن

**. هەڵفڕێن / hełf(i)řên/**: پاشەوشە. ـ فڕێن؛ وە فڕێن خەر ‹کەوهەڵفڕێن› ☰ ـ پران

**هەڵفلیقان / hełf(i)lîqan/**: چاوگ. هەڵفلیقان؛ هەڵفلیقیان؛ پلیخانەوە ☰ لهیدن

**هەڵفلیقاندن / hełf(i)lîqandin/**: چاوگ. هەڵفلیقانن؛ پلیخاندنەوە ‹لە لاجانگیدا ئەسپێ دەردێنێ/ لەگەڵ ترخێنە هەڵیەفلیقێنێ! «پیرەمێرد»› ☰ لە کردن

**هەڵفلیقاو / hełf(i)lîqaw/**: ئاوەڵناو. هەڵفلیقاو؛ هەڵفلیقاوە؛ هەڵفلیقیاگ؛ فلیقاوە؛ پلیخاوە ☰ لە شدە

**هەڵفلیقان / hełf(i)łîqan/**: ☜ هەڵفلیقان

**هەڵفلیقانن / hełf(i)łîqanin/**: ☜ هەڵفلیقاندن

**هەڵفلیقاو / hełf(i)łîqaw/**: ☜ هەڵفلیقاو

**هەڵفلیقاوە / hełf(i)łîqawe/**: ☜ هەڵفلیقاو

**هەڵفلیقیاگ / hełf(i)łîqyag/**: ☜ هەڵفلیقاو

**هەڵفلیقیان / hełf(i)łîqyan/**: ☜ هەڵفلیقان

**هەڵفلێقانن / hełf(i)łêqanin/**: ☜ هەڵفلیقاندن

**هەڵفیڕان / hełfiřan/**: چاوگ. *[شووروەیی]* بەلەفیرە گرتن ☰ اسهال شدن

**هەڵفیڕاندن / hełfiřandin/**: چاوگ. *[شووروەیی]* ڕیانی پیسایی شل ☰ اسهالی ریدن

**هەڵقا / hełqa/**: ☜ ئاڵقە

⊡ **هەڵقا بەستن**: بە جەغز دانیشتن؛ کۆڕ بەستن ☰ حلقه بستن

**هەڵقاچان / hełqaçan/**: ☜ هەڵپاچین

**هەڵقاچین / hełqaçîn/**: ☜ هەڵپاچین

**هەڵقان / hełqan/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //هەڵقای؛ دەهەڵقێی؛ بهەڵقێ// تێگیران؛ گیر کردن ‹داوێنم دەو بزمارەی هەڵقا› ☰ گیر کردن (به چیزی)

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: هەڵقاو/ چاوگی نەرێنی: نەهەڵقان

**هەڵقاندن / hełqandin/**: ☜ هەڵکەندن

**هەڵقاو / hełqaw/**: ئاوەڵناو. تێگیراو؛ گیرخواردوو ☰ گیر کرده (درچیزی)

**هەڵقرتان / hełqirtan/**: چاوگ. ١. سەری دار، گیا یان شتێ بە مقەست بڕان ٢. هەڵگەڕانەوە؛ لێو وەرگێران ☰ ١. هرس شدن قسمت بالایی گیاه و... ٢. لب برگرداندن از ناخشنودی

**هەڵقرتاندن / hełqirtandin/**: چاوگ. ١. سەری

شـتێ (بـە مقەسـت و ...) قرتانـدن ۲. لـچ هەڵقرچاندن؛ لێو وەرگێڕان؛ لـچ خـوار کردنـەوە لەبەر وەڕەزی یان خەمباری ≡ ۱. سرِ هرچیزی را (با قیچی و ...) بُریدن ۲. لب برچیدن

**هەڵقرتاو** / helqirtaw/: ئاوەڵناو. سەر بـە قـەیچی براو ≡ سرقیچی شده

**هەڵقرچان** / helqirçan/: چاوگ. هەڵـقرچیان: ۱. لە سەر ئاگر چۆقین ۲. گنج و چرچ تێکەوتن لە گەرمان یا لە تینی ئاگر ‹ئەو سەبوونەمان لە کوێـوە بـۆ هـات؟/ بـە تـینی گـەرمی هەڵـقرچا ولات! «پیرەمێرد»› ۳. *[مەجاز]* کرووزانەوە؛ پاڕانەوە ≡ ۱. بر آتش تفیدن ۲. از شدت گرما چـروک برداشـتن ۳. التماس کردن

**هەڵقرچاندن** / helqirçandin/: چاوگ. ۱. لە سەر ئاگر چۆقاندن (وەک: ڕۆن و ...) ‹پرشنگی جەوری هەڵیقرچاندم/ سەودای دڵـداری جـەرگی سـووتاندم «پیرەمێرد»› ۲. گنجدار کردن؛ بـە چـرچ و لـۆچ کردن ≡ ۱. بر آتش تفـت دادن ۲. چـین و چـروک کردن

**هەڵقرچاو** / helqirçaw/: ئاوەڵناو. هەڵقرچیاگ: ۱. چۆقاو ۲. چرچ و لۆچ بوو ≡ ۱. تفیده ۲. چروکیده

**هەڵقرچیاگ** / helqirç(i)yag/: ☜ هەڵقرچاو

**هەڵقرچیان** / helqirç(i)yan/: ☜ هەڵقرچان

**هەڵقلیشان** / helq(i)llîşan/: چاوگ. لـە سـەر تـا خوار قەڵشین ≡ برشکافته شدن

**هەڵقلیشاندن** / helq(i)llîşandin/: چاوگ. لە سـەر تا خوار قەڵشاندن ≡ برشکافتن

**هەڵقلیشاو** / helq(i)llîşaw/: ئاوەڵناو. ئەم سەر ئـەو سەر قەڵشاو ≡ شکافته شده

**هەڵقوتان** / helqutan/: چـاوگ. هەڵـقورتان؛ هەڵقورتیان: ۱. سەر بەرز کردنەوە لە ئاستێ ۲. خۆ هێنانە ناو کارێ کە فرێ بەسەرەوە نییە ≡ ۱. سرک کشیدن ۲. فضولی کردن

**هەڵقوتاندن** / helqutandin/: چـاوگ. هەڵـقورتاندن: ۱. سـەرەتاتکێ کـردن ۲. دەم تێوەردان بە نـاڕەوا ‹کـەم خـۆت لـە هـەموو شـت هەڵقوتێنە!› ≡ ۱. سرک کشیدن ۲. فضولی کردن

**هەڵقوت . هەڵقوت** / helqut helqut/: نـاو. هەڵقورت ـ هەڵقورت؛ کاری سـەر کێشـان و بـە دزییەوە ڕوانین ‹ئەرێ ئەم هەڵقوت ـ هەڵقوتەت لە چییە؟› ≡ عمل سرک کشیدن و دید زدن

**هەڵقوتێن** / helqutên/: ئاوەڵناو. هەڵـقورتێن: ۱. سـەرەتاتکێکـەر ۲. تیکـەچن؛ لاپرەسـەن؛ دەمتێوەدەر ≡ ۱. سَرَککش ۲. فضول

**هەڵقورتان** / helqurtan/: چـاوگ. ۱. ☜ هەڵقوتان ۲. وەرگێڕانـەوەی لێـو ≡ ۱. ☜ هەڵقوتان ۲. برچیدن لب از ناخشنودی

**هەڵقورتاندن** / helqurtandin/: چاوگ. ۱. ☜ هەڵقوتاندن ۲. وەرگەڕاندنـەوەی لـیچ ≡ ۱. ☜ هەڵقوتاندن ۲. لب ورچیدن

**هەڵقورت . هەڵقورت** / helqurt helqurt/: ناو. ۱. ☜ هەڵقوت ـ هەڵقوت ۲. کاری لێو وەرگێڕان ≡ ۱. ☜ هەڵقوت ـ هەڵقوت ۲. عمل لب برچیدن

**هەڵقورتیان** / helqurt(i)yan/: ☜ هەڵقوتان

**هەڵقورتێن** / helqurtên/: ☜ هەڵقوتێن

**هەڵقورینجان** / helqurîncan/: ☜ هەڵقورینجاندن

**هەڵقورینجاندن** / helqurîncandin/: چـاوگ. هەڵقورینجان؛ هەڵقورینجانن؛ ڕەبا دان؛ نقورچک گرتن ≡ نیشگون گرفتن

**هەڵقورینجانن** / helqurîncanin/: ☜ هەڵقورینجاندن

**هەڵقورینجاو** / helqurîncaw/: نـاو. هەڵقورینجێنراو؛ جێگای نقورچک لـێ گـیراو ≡ جای نیشگون

**هەڵقورینجێنراو** / helqurîncênraw/: ☜

**هەڵقورینجاو**

**هەڵقوڕان / hełquřan/**: چاوگ. تێنەپەڕ. //هەڵقوڕای؛ هەڵـدەقوڕێی؛ هەڵـقوڕێ// هەڵـقۆڕان؛ بـە فـڕ خواردنەوە ‹جامی ژەهرەکەی یەکبـین هەڵـقوڕا!› ≡ نوشیدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: هەڵقوڕاو/ چاوگی نەرێنی: هەڵنەقوڕان

**هەڵقوڕانـدن / hełquřandin/**: چـاوگ. تێـپەڕ. //هەڵـتقوڕاند؛ هەڵـدەقوڕێنی؛ هەڵـقوڕێنە// هەڵقوڕانن؛ هەڵـقوڕین؛ هەڵـقۆڕانن؛ فـڕ کـردن؛ خواردنەوەی یەک سـەرە ‹وا هاتینـە سـەر بـەیتی ترخێنە/ کە ترخێنە هات هەڵـیقوڕێنە «پیرەمێـرد»› ≡ سر کشیدن

■ ئاوەڵـناویبـەرکاری: ـــ/ چـاوگی نـەرێنی: هەڵنەقوڕاندن

**هەڵقوڕانن / hełquřanin/**: ☜ هەڵقوڕاندن

**هـەڵقـوڕاو / hełquřaw/**: ئاوەڵـناو. هەڵـقۆڕیاگ؛ فڕکراو ≡ سرکشیده

**هەڵقوڕین / hełquřîn/**: ☜ هەڵقوڕاندن

**ـ هەڵقـوڕێن / hełquřên/**: پاشەوشە. فڕکـەر ≡ ـــ نوش

**هـەڵقـوڵان / hełqułan/**: چـاوگ. هەڵقوڵـیان؛ هەڵقوڵین: ١. بە تەوژم دەرچـوونی تـراو بـەرەو سەر ٢. هەڵقونیان؛ لەنکاو دەرکەوتن ≡ ١. فَوَران کردن ٢. ناگهان پدیدار شدن

**هەڵقوڵاندن / hełqułandin/**: چاوگ. بوونـە هـۆی هەڵقوڵان ≡ برجوشاندن

**هـــەڵقوڵانـــەوە / hełqułanewe/**: چــــاوگ. ١. هەڵـقوڵان ٢. دیسـانەوە هەڵـقوڵان ‹دیسـان دوو چاوی سووری وەتەن بوو بە گۆمی خوێن/ فرمێسـک وەکـوو فـوارە لـە دڵ هەڵـقوڵایەوە «بێخـود»› ≡ ١. فَوَران کردن ٢. باز فَوَران کردن

**هەڵقوڵاو / hełquław/**: ئاوەڵناو. هەڵقوڵـیو: ١. بـە تەوژم بۆ سەرەوە دەرچوو ٢. لـەنکاو دەرکـەوتوو ≡ ١. فَوَران‌کرده ٢. ناگهان پدیدار شده

**هەڵقوڵتان / hełqułtan/**: چاوگ. هەڵقوڵتیان: ١. هەڵـقوڵان ٢. قوڵـت لـێ دان؛ کوڵـینی تـراو ٣. لـەنکاو دەرکـەوتن ٤. لێـو کـۆ کردنـەوە وەک خونچە ≡ ١. فَوَران کـردن ٢. جوشـیدن ٣. ناگهـان پدیدار شدن ۴. لب غُنچه کردن

**هەڵقوڵتیان / hełqułt(i)yan/**: ☜ هەڵقوڵتان

**هەڵقوڵیان / hełqułyan/**: ☜ هەڵقوڵان

**هەڵقوڵین / hełqułîn/**: ☜ هەڵقوڵان

**هەڵقوڵیو / hełqułîw/**: ☜ هەڵقوڵاو

**هەڵقوم / hełqum/**: ناو. بـاز؛ بازبـاز؛ بازبـازێن ≡ پرش

**هـەڵقـون / hełqun/**: نـاو. قنـــە؛ قونــە؛ ڕەوتی ڕۆیشتنی هێندێک باڵدار (وەک: کەو) ≡ حالت راه رفتن برخی پرنده (مانند: کبک)

**هـەڵقـون ـ داقـون / hełqun daqun/**: ئاوەڵـکار. هەڵـخەوداخە؛ شـێوە ڕۆیشـتنی بـە بـەرزایی و نزماییدا ≡ حالت بالا و پایین شدن در پیاده‌روی

**هەڵقون ـ هەڵقون / hełqun helqun/**: نـاو. کـاری قنە کردن؛ ڕۆیشتنی هێندێک باڵـدار ≡ وَرجـه ـ وورجه

**هەڵقونیان / hełqunyan/**: چاوگ. لە پڕ بـەر چـاو هاتن ‹چەن جوانە هەڵقونیان بەرغەل لە شێو و دۆڵ/ تێکـەڵ یەحـە و گدگـد، منداڵـە دیهـاتی «کاکـە ئەحمەد»› ≡ ناگهان پدیدار شدن

**هەڵقۆڕان / hełqořan/**: ☜ هەڵقوڕان

**هەڵقۆڕانن / hełqořanin/**: ☜ هەڵقوڕاندن

**هەڵقۆڕیاگ / hełqořyag/**: ☜ هەڵقوڕاو

**هـەڵقـە / hełqe/**: نـاو. ١. ☜ **ئاڵقـە** ٢. هەوقـە؛ فێڵ؛ گزی ≡ ١. ☜ **ئالقه** ٢. حیله

**هەڵقەباز / hełqebaz/**: ئاوەڵناو. ١. جادووگـەر ٢. فێڵباز ≡ ١. جادوگر ٢. حقه‌باز

**هەڵقەبەگوێ / hełqebeg(i)wê/**: ئاوەڵناو. [کینایە] هەڵــقەبەگۆش؛ هەڵــقەلەگوێ؛ گــوێلەمســـت؛ گوێڕایــەڵ؛ گــۆش‌بــەراواز؛ فەرمانبــەری وەکــوو نۆکەری وا چما خاوەنەکــەی ئاڵــقەی لــە گــوێی کردووە ☰ حلقه‌به‌گوش

**هەڵقەبەگۆش / hełqebegoş/**: ☚ هەڵقەبەگوێ

**هەڵقەتڕان / hełqet(i)řan/**: ناو. [پلار] ڕەوتی لێک کۆ بووونەوەی هەتیو مەتیو ☰ حالت گرد هم آمدن اوباش

**هەڵقەتڕانێ / hełqet(i)řanê/**: نـاو. [پلار] کـۆڕی هەتیو مەتیو ☰ پاتوق اراذل و اوباش

**هەڵقەتیز / hełqetîz/**: ناو. ئاڵــقەتیز ☰ گیـاهی بـا شیرەی مُسهل

**هەڵقەتیزان / hełqetîzan/**: نــاو. کۆمەڵـــی جەفەنگبازان ☰ مجلس بذله‌گویان

**هەڵقەتیزانێ / hełqetîzanê/**: ناو. کۆڕی گــەپ و گاڵتەبێژان ☰ جمع لطیفه‌گویان

**هەڵقەلەگوێ/ hełqeleg(i)wê/**: ☚ هەڵقەبەگوێ

**هەڵقەمچان / hełqemçan/**: چاوگ. هەڵــقرچان؛ ترنجان ☰ چروکیدن از گرما

**- هەڵقەن / hełqen/**: پاشەوشە. ـــ کـەن؛ ـ کـۆڵ ‹گۆڕهەڵقەن› ☰ ـ کن

**هەڵقەناندن / hełqenandin/**: چاوگ. هەڵــکەندن ‹لە دنیادا ئیلاهی هەر بمێـنن/ بنـەی بـێ‌ئیتیفـاقیی هەڵقەنێنن «حاجی قادر»› ☰ برکندن

**هەڵقەناو / hełqenaw/**: ☚ هەڵکەندراو

**هەڵقەندار / hełqendar/**: نـاو. جـۆرێ تفـەنگی ڕەشۆکی کۆن ☰ نوعی تفنگ قدیمی

**هەڵقەندران / hełqend(i)ran/**: ☚ هەڵقەنران

**هەڵقەندراو / hełqend(i)raw/**: ☚ هەڵکەندراو

**هەڵقەندن / hełqendin/**: ☚ هەڵکەندن

**هەڵقەندنەوە / hełqend(i)newe/**: چـــاوگ. هەڵقەننەوە؛ هەڵکەندنەوە: ١. دیسان هەڵــقەندن ٢. بە بنـەوە دەرهێنـانی گیـا و ڕوەک لـە زەوی ‹ئەوڕۆ هەرەوەزی چەوەندەر هەڵــقەندنەوەیە› ☰ ١. بازکنــدن ٢. از ریشــه کنــدن گیــاه و محصــولات کشاورزی

**هەڵقەنران / hełqenran/**: چاوگ. هەڵقەندران؛ لە بنەوە دەرهێنران ☰ برکنده شدن

**هەڵقەنراو / hełqenraw/**: ☚ هەڵکەندراو

**هەڵقەننەوە / hełqennewe/**: ☚ هەڵقەندنەوە

**هەڵک / hełk/**: ☚ هەڵگ

**هەڵکاڵان / hełkałan/**: چـاوگ. هەڵکاڵــیان؛ هەڵکاڵین؛ بە ئێرەیی بـاس یـا تماشـا کـردن ☰ حسودانه سُخن گفتن یا نگاه کردن

**هەڵکاڵیان / hełkałyan/**: ☚ هەڵکاڵان

**هەڵکاڵین / hełkałîn/**: ☚ هەڵکاڵان

**هەڵکران / hełk(i)ran/**: چـاوگ. ١. پـێ بـوون؛ هەڵبوونی ڕۆشنایی و ئاگر ‹ئاگرێکی خۆش هەڵکرا و چـای خـورا› ٢. بــەرز کرانــەوە؛ هەڵــدران ‹هەڵکرانــی ئـاڵا› ٣. خـڕ کـرانی بـەن ‹بەنەکـە هەڵکرا› ٤. ڕابواردنی ژیان ‹هەڵکران بە دەستەنگی و نەدارییەوە نە هاسـانە› ٥. بەرە ژوور بـران (وەک: داوێن و قۆڵ و...) ☰ ١. افروخته شدن ٢. برافراشته شدن ٣. گلوله شدن نخ ۴. گذران زندگی ۵. ورمالیده شدن

**هەڵکرانەوە / hełk(i)ranewe/**: چـاوگ. دیسـان بەرزەوە بوون ‹لیـوایی شـادی و فـەرەح بـە جـارێ هەڵکرایەوە/ موقەددیمـەی شـکۆفە هـەر لـە شـاهی نەوبەهار ئەکا «بێخود»› ☰ برافراشته شدن

**هەڵکراو[1] / hełk(i)raw/**: ئاوەڵناو. هەڵـکریاگ: ١. لە شتێ پێچراو (داو) ٢. بەرە ژوور بـراو (داوێـن و قۆڵ) ‹بە قۆڵی هەڵـکراویدا زانـیم دەچـێ دەسـنوێژ بگـرێ› ٣. بــەرزەوەکراو ‹ئـاڵای هەڵــکراو› ٤. داگیرساو ‹پەروانە نیم کە عاشقی شـەمعی کـوژاوە بم/ پەروای چرایی تاکوو ئەبەد هەڵکراومە «بێخـود»›

🇮🇷 ١. پیچیده ٢. ورمالیده ٣. برافراشته ۴. برافروخته

**ـ هەڵکراو**[٢]: پاشوشە. ــ هەڵــکریاگ ‹ڕۆژێ بــە پێکەنینەوە، یار پێ‌وتم وەرە/ بۆ پاسی نیوەشەو، سەگی قوڵهەڵکراوەکەم! «ئەحمەد بەگی جاف»› 🇮🇷 ورمالیده

**هەڵکرچان** / helkirçan/: چاوگ. هەڵــکرچیان؛ هەڵکرچین؛ چرچ و لۆچ بوون 🇮🇷 چین و چروک برداشتن

**هەڵکرچاندن** / helkirçandin/: چـاوگ. چــرچ و لۆچ کردن 🇮🇷 چین و چروک کردن

**هەڵکرچاو** / helkirçaw/: ناوەڵناو. چــرچ و لــۆچ 🇮🇷 چین خورده

**هەڵکرچیان** / helkirç(i)yan/: ☜ هەڵکرچان

**هەڵکرچین** / helkirçîn/: ☜ هەڵکرچان

**هەڵکرد** / helkird/: ناو. ڕەوتی گوزەران و ڕابواردن ‹تینی بگاتــێ، دڵ ئــەبێ خــەجڵ/ دڵــیش بــەبێ تــۆ هەڵکردی موشکڵ «پیرەمێرد»› 🇮🇷 گُذران( زندگی)

**هەڵکردن** / helkirdin/: چاوگ. ١. گوزەران کردن ‹گــوتی: نــەمگوت نــاتوانی لەگــەڵ مــن هەڵــکەی؟ «هەژار، *قورئان*»› ٢. بــەرەژوور بــردن (دەلینــگ و داوێــن و قــۆڵ) ‹داوێنــت هەڵــکە تــەڕ نــەبێ!› ٣. پێ‌کردن؛ داگیرساندن ‹هەموو ساڵێ ئاگری نەورۆز هەڵدەکەین› ٤. هێنانــەوە بــەرەو بــاری ئاســۆیی (ئاوی جۆگــە) ٥. هەڵدان؛ بەرپا کردن ٦. شــهین؛ وەزیــن؛ هــاتنی بــا ‹ســا خوایــە هەڵــکەی کــزەی شەماڵــێ/ هــەوای ژەنگــی خــەم لــە دڵ بماڵــێ «پیرەمێرد»› ٧. تۆپەڵ کردنی بەن ‹لە بەیانییــەوە دوو ماشەرم هەڵــکەردووە› 🇮🇷 ١. گذراندن زنـدگی ٢. ورمالیدن ٣. افروختن ۴. انداختن در مسیر افقی (جوی آب) ۵. برپا کردن ۶. وزاندن ٧. گلوله کردن نخ

**هەڵکردنەوە** / helkird(i)newe/: چــاوگ. ١. هەڵوێزانن؛ ماشەرە بەن کردنە گلۆلە ٢. دیســان داییسانی ئــاگر 🇮🇷 ١. گلوگـه کـردن نـخ ٢. دوباره افروختن

**هەڵکرن** / helk(i)rin/: چـاوگ. ١. هەڵــکردن؛ گــوزەران کــردن ٢. تواندنــەوە؛ تاواندنــەوە ٣. هانەدان؛ هەڵخڕاندن 🇮🇷 ١. گذراندن زندگی ٢. ذوب کردن ٣. برانگیختن

**هەڵکریاگ** / helkiryag/: ☜ هەڵکراو

**هەڵکریان** / helkiryan/: ناو. ١. گلۆلە کران (بــەن و ...) ٢. هەڵدران؛ بەرپا بــوون (ئــاڵا و ...) 🇮🇷٢ ١. گلوله شدن (نخ و...) ٢. برپا شدن

**هەڵکران** / helk(i)řan/: چاوگ. ١. بــە چنــگ و نینۆک کــریان ٢. خورانــدن 🇮🇷 ١. حــک کــردن و سایدن با ناخن و تیغ ٢. خاراندن

**هەڵکراندن** / helk(i)řandin/: چاوگ. هەڵــکڕانن: ١. بە نینۆک یان شتێکی تیژ، شتێ لە شتێ جیا کردنــەوە ٢. خورانــدنی بــە تــەوژم ‹بــەس خــۆ هەڵکڕێنە! پێستت خوێنی بەربوو› 🇮🇷 ١. حک کردن ٢. شدید خاراندن

**هەڵکرانن** / helk(i)řanin/: ☜ هەڵکراندن

**هەڵکراو** / helk(i)řaw/: ناوەڵــناو. ١. لێ هەڵــکنراو ٢. خورێندراو؛ خوراو 🇮🇷 ١. حک شده ٢. خارانده

**هەڵکردران** / helkiřd(i)ran/: چاوگ. ڕنان؛ ڕنیان؛ کنیانەوە 🇮🇷 کنده شدن

**هەڵکرووزان** / helk(i)řûzan/: چــــاوگ. هەڵکوڕووزان؛ تۆزێ بە ئاگر ســووتان 🇮🇷 سـطحی سوختن

**هەڵکرووزاندن** / helk(i)řûzandin/: چــاوگ. هەڵــکوڕووزاندن؛ کــەمێ بــە ئــاگر ســووتاندن 🇮🇷 سطحی سوزاندن

**هەڵکرووزاو** / helk(i)řûzaw/: ناوەڵـــــناو. هەڵکوڕووزاو؛ کەمێ سووتاو بــە ئــاگر 🇮🇷 ســطحی سوخته

**هەڵکزان** / helk(i)zan/: چـاوگ. هەڵــکزیان؛ هەڵکزین؛ سوورەوە بوونی گۆشت لە سەر ئاگر 🇮🇷 سرخ شدن گوش بر آتش

**هەڵکزاندن / hełk(i)zandin/**: چاوگ. هەڵکزانن؛ برژاندنی گۆشت لە سەر ئاگر ≋ کباب کردن گوشت بر آتش

**هەڵکزانن / hełk(i)zanin/**: ☜ **هەڵکزاندن**

**هەڵکزاو / hełk(i)zaw/**: ئاوەڵناو. سوورەوەکراوی ڕەقەوەبوو ‹بۆنی کەبابە، بۆچەکی چزڵیکە دێ لە دوور/ یا بۆچرووکی جەرگ و دڵی هەڵکزاومە؟ «بێخود»› ≋ سرخ شدەی سفت شده

**هەڵکزیان / hełkizyan/**: ☜ **هەڵکزان**

**هەڵکزین / hełk(i)zîn/**: ☜ **هەڵکزان**

**هەڵکش / hełkiş/**: ناو. ١. کاری بەرەژوور چوون ‹بۆ کێو هەڵکشان› ٢. ڕەوتی دەرکێشانی خەنجەر و شیر ٣. هاتنە پێشی ئاوی دەریا ≋ ١. عمل رو به بالا رفتن ٢. آختگی تیغ ٣. مَد آب دریا

**هەڵکشان / hełk(i)şan/**: چاوگ. هەڵکشیان؛ هەڵکشین: ١. بەرەو ژوور چوون ‹ڕائەپەڕم بەربەیان/ هەڵ ئەکشێم بۆ لووتکەی جوان «گۆران»› ٢. دەرکێشانی خەنجەر و شیر ٣. هاتنە پێشی ئاوی دەریا ✽ بەرانبەر: **داکشان** ≋ ١. رو بە بالا رفتن ٢. آختن تیغ ٣. مدّ شدن دریا

**هەڵکشاندن / hełk(i)şandin/**: چاوگ. هەڵکشانن: ١. بەرەو سەر کێشان ٢. دەرکێشان (خەنجەر و شیر) ٣. دەرهێنان؛ دەرهاوردن ≋ ١. بە بالا کشیدن ٢. برکشیدن؛ آختن ٣. بیرون آوردن

**هەڵکشانن / hełk(i)şanin/**: ☜ **هەڵکشاندن**

**هەڵکشاو[1] / hełk(i)şaw/**: ☜ **هەڵکشاوی**

**هەڵکشاو[2]**: ئاوەڵناو. ١. بەرەو بالا ڕۆیشتوو ٢. دەرکێشراو ≋ ١. رو بە بالا رفتە ٢. برکشیدە؛ آختە

**هەڵکشاوە / hełk(i)şawe/**: ☜ **هەڵکشاوی**

**هەڵکشاوی / hełk(i)şawî/**: ناو. هەڵکشاو؛ هەڵکشاوە؛ مەددە؛ نیشانەی دەنگ درێژ کردن لە سەر پیتی نووسراو ≋ علامت مد بر حروف

**هەڵکشە / hełkişe/**: ناو. ١. ڕەوتی هاتنە پێشەوەی ئاوی دەریا ٢. ڕەوتی بەرەو ژوور کشانەوە؛ چوونە سەر ٣. چۆنیەتی بەرەو ژوور چوون ‹بووکامە هەڵکشە و داکشە دەزانێ› ≋ ١. مَد آب دریا ٢. برگشت رو بە بالا ٣. صعود

**هەڵکشەوداکشە / hełk(i)şe w dak(i)şe/**: ناو. ١. چۆنیەتی ژوور و خوار کردن ‹بووکا مە هەڵکشەوداکشە دزانێ› ٢. دۆخی بان و خوار کردنی ئاوی دەریا ≋ ١. صعود و نزول ٢. جزر و مد

**هەڵکشیان / hełkişyan/**: ☜ **هەڵکشان**

**هەڵکشین / hełk(i)şîn/**: ☜ **هەڵکشان**

**هەڵکشیو / hełk(i)şîw/**: ئاوەڵناو. ١. بەرەو ژوور ڕۆیشتوو ٢. بەرەو ژوور ڕاکێشراو ≋ ١. صعود کردە ٢. برکشیدە

**هەڵکفان / hełk(i)fan/**: ☜ **هەڵکفین**

**هەڵکفاندن / hełk(i)fandin/**: چاوگ. کاری وەک بە ئەسکوێ تێکەڵ دانی چێشتێ کە هەڵدەچێ و دەبێتە هۆی کەف هەڵێنان ≋ کف بە سطح آوردن

**هەڵکفیان / hełkifyan/**: ☜ **هەڵکفین**

**هەڵکفین / hełk(i)fin/**: چاوگ. هەڵکفان؛ هەڵکفیان: ١. هەڵچوون لە سەر ئاگر و کەف لێ ڕژان ٢. هەڵازنانی پێست لە زیپکە ٣. ئەستوور بوون لە با کردن ٤. هەڵاتن؛ پف کردن (هەویر و ...) ٥. هەڵمسان و نزیک لە تەقینەوە بوونی بارووت ≋ ١. سر رفتن بر آتش ٢. پُرجوش شدن پوست ٣. آماسیدن ۴. ور آمدن (خمیر و ...) ۵. برآمدن و بە حالت انفجار رسیدن باروت

**هەڵکلاشیان / hełkiłaş(i)yan/**: ☜ **هەڵکەندران**

**هەڵکلاشین / hełk(i)łaşîn/**: ☜ **هەڵکەندن**

**هەڵکلۆشین / hełk(i)łoşîn/**: چاوگ. قەوارتن؛ قەوارین؛ بە کۆڵین ناوەڕۆک دەرهێنان ≋ شکم (چیزی را) خالی کردن

**هەڵکنیاگ / hełkinyag/**: ☜ **هەڵکەندراو**

**هەڵکنیان / heɫkinyan/:** ☜ **هەڵکەندران**

**هەڵکوت / heɫkut/:** ئاوەڵکار. بە پەلە و بـە غـار ▤ شتابان؛ با شتاب

**هەڵکوتـان / heɫkutan/:** چـاوگ. هەڵـکوتیان؛ پەلامار دان ‹شەو هەڵیان‌کوتا سـەرمان› ▤ یـورش بردن

**هەڵکوتاندن / heɫkutandin/:** چاوگ. ۱. پـەلامار دان ۲. دەرکێشان (بزمار و...) ▤ ۱. یورش کـردن ۲. برکندن (میخ و ...)

**هەڵکوتن / heɫkutin/:** چاوگ. پەسـند دان؛ پێـدا هەڵدان ▤ ستودن

**هەڵکوتۆک / heɫkutok/:** ناو. جـۆرێ هەڵـپەڕکێی کوردانە لـە کوردسـتانی بـاکوور ▤ نـوعی رقـص گروهی

**هەڵکوت . هەڵکوت / heɫkut heɫkut/:** ئاوەڵکار. بـە غار و بە پەلە ▤ دوان ـ دوان

**هەڵکوتیان / heɫkutyan/:** ☜ **هەڵکوتان**

**هەڵکورمـان / heɫkurman/:** چـاوگ. تێنەپـەڕ. //هەڵـکورمای؛ هەڵـدەکورمێی؛ هەڵـکورمە// هەڵکوروشمان: ۱. کز کردن و سـەر بردنـە ژێـر باڵـی باڵـدار ‹جووتـێ کـۆتری سـەربەکڵاوە/ هەڵکورماون لە سوانەیەک «هێمن»› ۲. *[کینایە]* لـە بن‌سووچێ کز کردن ▤ ۱. کِز کردنـو سـر زیـر پـر کردن پرنده ۲. کُنجی گرفتن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: هەڵکورماو/ چاوگی نەرێنی: هەڵنەکورمان

**هەڵکورمـاو / heɫkurmaw/:** ئاوەڵـناو. هەڵکوروشماو: ۱. کزکردوو ۲. *[کینایە]* گۆشـەگیر و لاپەڕ ▤ ۱. کِزکردە ۲. گوشەگیر

**هەڵکوروشمان / heɫkuruşman/:** ☜ **هەڵکورمان**

**هەڵکوروشماو / heɫkuruşmaw/:** ☜ **هەڵکورماو**

**هەڵکوڕووزان / heɫkuřûzan/:** ☜ **هەڵکڕووزان**

**هەڵکوڕووزانـدن / heɫkuřûzandin/:** ☜ هەڵکڕووزاندن

**هەڵکوڕووزاو / heɫkuřûzaw/:** ☜ **هەڵکڕووزاو**

**هەڵکوش / heɫkuş/:** ☜ **هەڵگوش**

**هەڵکوشان / heɫkuşan/:** ☜ **هەڵگوشین**

**هەڵکوشین / heɫkuşîn/:** ☜ **هەڵگوشین**

**هەڵکولۆش / heɫkułoş/:** ناو. هەڵقەن؛ هەڵکەن ▤ کاوندە؛ کَنَندە

**هەڵکولۆشـان / heɫkułoşan/:** چـاوگ. ۱. هەڵکولۆشـیان؛ هەڵـکنیان؛ هەڵـقەنران ۲. هەڵکولۆشین؛ هەڵکەندن؛ هەڵقەندن ▤ ۱. کنـدە شدن ۲. کندن

**هەڵکولۆشانن / heɫkułoşanin/:** ☜ **هەڵکولۆشان ـ۲**

**هەڵکولۆشـیان / heɫkułoş(i)yan/:** ☜ **هەڵکولۆشان ـ۱**

**هەڵکولۆشین / heɫkułoşîn/:** ☜ **هەڵکولۆشان ـ۲**

**هەڵکۆڵران / heɫkołran/:** چاوگ. هەڵـکەنران لـە سەر شتی سەخت ▤ حک شدن

**هەڵکۆڵین / heɫkołîn/:** چاوگ. تێپەڕ. //هەڵتکۆڵـی؛ هەڵدەکۆڵـی؛ هەڵکۆڵـە// هەڵـکوولین: ۱. دانـەوە (زەمین و ...) ۲. نـاو دەرهێنـان ‹دار هەڵکۆڵـین؛ ددان هەڵکۆڵین› ▤ ۱. کندن ۲. خالی کردن (درون)

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: هەڵکۆڵیو/ چاوگی نەرێنی: هەڵنەکۆڵین

**هەڵکوولین / heɫkûlîn/:** ☜ **هەڵکۆڵین**

**هەڵکەتی / heɫketî/:** ئاوەڵـکار. بـە هەڵـکەوت؛ گزوگومەت ▤ اتفاقی

**هەڵکەفت / heɫkeft/:** ☜ **هەڵکەوت**[1]

**هەڵکەفتگ[1] / heɫkeftig/:** نـاو. پێشـهاتی بـێ ئاگاداری ▤ رویداد غیرمنتظرە

**هەڵکەفتگ[2]:** ☜ **هەڵکەوتو**[2]

**هەڵکەفتن / heɫkeftin/:** ☜ **هەڵکەوتن**

**هەڵکەفتە / heɫkefte/:** ☜ **هەڵکەوتو**[1]

**هەڵکەفتی** / helkeftî/: ☜ **هەڵکەوتو**[1]

**. هەڵکەن** / helken/: پاشەوشە. ـ هەڵقەن؛ ـ بکەن ‹قەبرهەڵکەن› ⇐ ـ کاو

**هەڵکەندران** / helkend(i)ran/: چاوگ. هەڵکنیان؛ هەڵکەنران؛ هەڵکلاشیان؛ کەوتنە بەر هەڵکەندنەوە ⇐ برکنده شدن

**هەڵکەندراو** / helkend(i)raw/: ئاوەڵناو. هەڵقەناو؛ هەڵقەندراو؛ هەڵقەنراو؛ هەڵکەنراو؛ هەڵکەنیاگ؛ هەڵکنیاگ؛ کەندراو ⇐ کنده شده

**هەڵکەندن** / helkendin/: چاوگ. هەڵقاندن؛ هەڵقەندن؛ هەڵکلاشین؛ هەڵکەنن: ١. کەندن؛ کۆڵین ‹بولبول خەریکە تەوقی سەری هەڵکەنێ بە چنگ/ گوڵچین کە دێتە باخ و تەمای گوڵ چنین ئەکا «بێخود»› ٢. هەڵکێشان ‹کێ لە باغی قودسی هەڵکەندم؟ هەر ئەو/ ناشتی لەم شۆرەزارەم ناشتیم «مەحوی»› ⇐ ١. کندن ٢. برکندن

**هەڵکەندنەوە** / helkend(i)newe/: ☜ **هەڵقەندنەوە**

**هەڵکەنران** / helkenran/: ☜ **هەڵکەندران**

**هەڵکەنراو** / helkenraw/: ☜ **هەڵکەندراو**

**هەڵکەنن** / helkenin/: ☜ **هەڵکەندن**

**هەڵکەنیاگ** / helkenyag/: ☜ **هەڵکەندراو**

**هەڵکەوت**[1] / helkewt/: ناو. ١. هەل؛ دەرفەت ٢. پێشهات؛ ڕێکەوت؛ ڕووداو ⇐ ١. فُرصت ٢. اتفاق

**هەڵکەوت**[2]: ئاوەڵکار. هلکەتی؛ هۆرکەوت؛ هەڵکەفت؛ بەدەگمەن ⇐ اتفاقی

**هەڵکەوتن** / helkewtin/: چاوگ. هلکەتن؛ هەڵکەفتن: ١. ڕەخسان؛ ڕوودانی پێشهاتی دەگمەن ‹ئەوەی بۆ گووکەر هەڵدەکەوێ، بۆ ڕاوکەر هەڵناکەوێ «مەسەل»› ٢. لە قورگ گیران (ئاو یان پاروو) ٣. هەڵەنگووتن؛ نوچکە دان ‹لەو بەردە هەڵکەوتم› ٤. لەتر دان؛ ڕەت بردن ٥. لە بەر چاو کەوتن ٦. لە هەموو کەوتنە پێش؛ بەرز بوونەوە ٧. مانەوە ٨. بەرەو ژوور چوون ٩. هەڵدان؛ پێشکەوتن ١٠. بوون؛ جێ گرتن ‹شاری سەردەشت لە ڕۆژاوای ئێران هەڵکەوتووە› ⇐ ١. پیش آمدن ٢. در گلو گیر کردن (آب یا لقمه) ٣. سکندری خوردن ۴. تلو تلو خوردن ۵. از چشم افتادن ۶. برجسته شدن ٧. بازماندن ٨. صعود کردن ٩. ترقی کردن ١٠. قرار داشتن؛ واقع شدن

**هەڵکەوتو**[1] / helkewtû/: ناو. هەڵکەوتە؛ هلکەتی؛ هەڵکەفتگ؛ هەڵکەفتە؛ هەڵکەفتی ‹هەی ڕۆ! تومەز گوڵاڵە نەبوو، خوێنی لاوێک بوو/ هەڵکەوتوویەک بوو بۆ هەموو کورد، نووری چاوێک بوو «پیرەمێرد»› ⇐ نابغه

**هەڵکەوتو**[2]: ئاوەڵناو. هەڵکەوتە؛ جیاواز؛ جیاکار؛ بێوێنە ‹لە خانەدانی سیادەت، لە دوودمانی عولووم/ لە جێ‌هەواری سەخا خاتەمێکی هەڵکەوتوو «بێخود»› ⇐ برجسته

**هەڵکەوتە** / helkewte/: ☜ **هەڵکەوتو**

**. هەڵکێش** / helkêş-/: پاشەوشە. ـ هلکێش؛ بەرەو بەرزی بەر ‹خۆهەڵکێش؛ دارهەڵکێش› ⇐ ـ بالاکِش

**هەڵکێشان** / helkêşan/: چاوگ. هلکێشان؛ هەڵکێشانن: ١. دەرکێشان؛ لە بنەوە دەرهێنان ‹دارهەڵکێشان› ٢. بۆ سەرەوە کێشان ‹هەڵیکێشە با بێتە سەر!› ٣. هەناسەی قووڵ دان ‹هەناسەی هەڵکێشا› ٤. تاریف کردن؛ بۆ سەرەوە بردن ‹خۆ هەڵکێشان› ⇐ ١. بیرون کشیدن ٢. به بالا کشیدن ٣. آه کشیدن ۴. مدح کردن

**هەڵکێشانن** / helkêşanin/: ☜ **هەڵکێشان**

**هەڵکێشران** / helkêşran/: چاوگ. هەڵکێشیان؛ کێشران بەرەو بان ⇐ برکشیده شدن

**هەڵکێشیان** / helkêşyan/: ☜ **هەڵکێشران**

**هەڵگ** / helg/: ناو. هەڵک؛ کۆشش و تەقالای زۆر ⇐ تلاش

**هەڵگر**[1] / hełgir/: ناو. شت یان کەسێ کە بارێک هەڵدەگرێ ‹هەڵگری نەوت› ▪ حامل

**هەڵگر**[2]: ئاوەڵناو. ١. لە خۆ گر ‹ئەم قسەیە هەڵگری مانایەکی قووڵە› ٢. ڕاگوێز؛ چۆنیەتی پێ بوون ‹کچی پێشمەرگە هەڵگری ئاڵای ئازادییە› ▪ ١. در بر دارنده ٢. حامل

**ـ هەڵگر**[3]: پاشوشە. ١. ـ ڕاگر ‹بارهەڵگر؛ شوێنهەڵگر› ٢. ـ ڕفێن ‹ڕێگر و حیز و دزە، ژنهەڵگر و ماڵانبڕە/ فائیدەی چی نێو و کونیەی خۆی موسوڵمان دادەنێ؟ «حاجی قادر»› ٣. قەبووڵکەر ▪ ١. ـ بردار ٢. ـ رُبا ٣. ـ پذیر

**هەڵگراو** / hełg(i)raw/: ئاوەڵناو. ١. ڕاگیراو ٢. ڕفێنراو (ژن) ▪ ١. نگهداری شده ٢. ربوده شده

**هەڵگرتن** / hełgirtin/: چاوگ. هلگـرتن؛ هەڵگردن: ١. لێ نەوین؛ بەرزەوە کردن ‹ئێوارەیە وا هەڵگرە سا گۆزەیی تازە/ ڕێی کانی قوبان! مونتەزیری جیلوەیی نازە «گۆران»› ٢. ڕجوا دیتن؛ قبووڵ کردن ‹خوا هەڵناگرێ؛ دڵم هەڵناگرێ› ٣. لاگرتن ‹سەری ئەم سندووقەم لەگەڵ هەڵگرە!› ٤. ڕاگرتن و پاراستن ‹ئەم پارەیەم بۆ هەڵگرە!› ٥. ڕادوو بردن؛ ڕەواندن (ژن) ‹کابرا ژنێکی هەڵگرتووە!› ٦. *[کنایە]* جوێن دانی زۆر ‹هەڵیگرت ئەمما هەڵگرتن! هەموو مردوومانی لە قەبر دەرێنا!› ٧. بەرگە گرتن؛ دەوام/ تاقەت هێنان ‹بەرماڵە گوناپۆشەکەشم وا شڕ بوو/ هەڵناگرێ تەقەڵ بە باری بیکەین پینە «هەژار، *چوارینەکانی خەییام*»› ٨. *[مەجاز]* هەڵاتن و غار دانی ئەسپ بە سوارەوە بێ ڕاوەستان ‹ئەسپ هەڵیگرتووە لە سوارچاکی خۆی نییە! «مەسەل»› ٩. هەڵبژاردن؛ تایبەت بە خۆ کردن ‹لەو کەوشانە جووتێکی هەڵگرە!› ١٠. هەڵێنانی لاقی نەخۆش لە ڕۆیشتنا ‹گایەکە پاشووی هەڵگرتووە› ١١. هەڵێنانی لاقی نەخۆش لە ڕۆیشتنا ‹گایەکە پاشووی هەڵگرتووە› ▪ ١. بلند کردن ٢. پذیرفتن ٣. برداشتن ۴. نگهداری کردن ۵. ربودن (زن) ۶ دشنام دادن بسیار ۷. تحمل کردن/ داشتن ۸ رمیدن با سوار (اسب) ۹. برداشتن ۱۰. با خود بردن ۱۱. بر زمین نگذاشتن پای مصدوم

**هەڵگرتنەوە** / hełgirt(i)newe/: چاوگ. ١. پرژ و بڵاو کۆ کردنەوە ٢. سزا وەرگرتن ‹ئەوا هەڵمانگرتەوە› ٣. قبووڵ کردنەوەی بێچوو لە لایەن دایکی نەبانەوە ‹بێچووەکەی هەڵگرتەوە› ٤. سڕینەوەی نووسراو ‹ئەم دوو کەلیمەیەی لێ هەڵگرەوە!› ٥. چنینەوەی گەوی بەر بوو لە کردا ‹گۆرەوییەکەم دوو گەوی بەر بوو هەڵمگرتەوە› ٦. دیسان هەڵگرتن ‹شەماڵە، گاڵەگاڵیەتی و لەکارە/ هەڵگرنەوە! شاباشی شای بەهارە «هەژار، *بۆ کوردستان*»› ▪ ١. جمع‌وجور کردن ٢. پاداش گرفتن ٣. دوباره پذیرفتن بچه توسط مادرش ۴. پاک کردن نوشته ۵. بافتن دانه‌های دررفته‌ی بافتنی ۶ باز برداشتن

**هەڵگرتەیی** / hełgirteyî/: ناو. دۆخی لە زەوی بەرزتر ڕۆیشتنی کەلا ▪ حالت بالاتر از زمین رفتن تیله

**هەڵگرد** / hełgird/: ئاوەڵناو. هەڵبژێردراو ‹پیشەی هەڵگردی من گەداییە/ مەیلی تۆ بۆ من شادی و شاییە «پیرەمێرد»› ▪ انتخابی

**هەڵگردن** / hełgirdin/: ☜ **هەڵگرتن**

**هەڵگرسان** / hełgirsan/: چاوگ. گڕ لێ پەیدا بوون ▪ افروخته شدن

**هەڵگرساندن** / hełgirsandin/: چاوگ. هەڵگرسانن؛ گڕ لێ پەیدا کردن ▪ افروختن

**هەڵگرسانن** / hełgirsanin/: ☜ **هەڵگرساندن**

**هەڵگرسیاو** / hełgirs(i)yaw/: ئاوەڵناو. هەڵکراو؛ ئاگری پێبوو ▪ افروخته

**هەڵگڕان** / hełg(i)řan/: چاوگ. ١. گڕ بەرزەوە بوون ٢. سووتان بە گڕ ٣. لەش هەلازنان بە

کوان و زیپکە ☰ ١. برافروختن ٢. با آتش سوختن ٣. بدن را جوش گرفتن

**هەڵگڕاندن / helg(i)řandin/:** چاوگ. گڕ تێ بەردان؛ هەڵگرساندن ‹هەر کەسێ مایل بە پیرێکە و تەریقێکی هەیە/ تۆ بە شوعلەی غەم حەریقی وا وەجاخت هەڵگڕاند «حەریق»› ☰ برافروختن (آتش)

**هەڵگڕان / helg(i)jan/:** چاوگ. گژان؛ پێکدا دان؛ دە گژ یەک ڕاچوون ‹تا زەمان ڕەنگی شەڕی بۆ ڕژان/ لەگەڵ تورکەکان پێکا هەڵگژان «قانع»› ☰ گلاویز شدن

**هەڵگڵۆفان / helg(i)łofan/:** ☜ هەڵگوڵۆفان

**هەڵگڵۆفتن / helg(i)łoftin/:** ☜ هەڵگوڵۆفان

**هەڵگڵۆفین / helg(i)łofin/:** ☜ هەڵگوڵۆفان

**هەڵگوازتن / helg(i)waztin/:** چاوگ. هەڵگواستن؛ هەڵگۆزان؛ هەڵگۆزین؛ هەڵگوورین؛ هەڵگەواشتن: ١. بەرەو ژوور ڕاگوێزان ‹ئاوێ لەو بیرە هەڵگوازە!› ٢. هەڵبواردن؛ خۆ لێ لا دان؛ بایەخ پێ نەدان ☰ ١. بالا کشیدن ٢. اعتنا نکردن

**هەڵگواستن / helg(i)wastin/:** ☜ هەڵگوازتن

**هەڵگوتن / helgutin/:** چاوگ. پێدا هەڵدان/ گوتن ‹زۆرم هەڵگوتووە بە بالای یاردا› ☰ ستودن

**هەڵگوستن / helgustin/:** چاوگ. هەڵکێشان (ئاو و ...) ☰ بالا کشیدن (آب)

**هەڵگوسیار / helgusyar/:** سارستە. وتەیەکە بۆ بانگ کردنی گەمەکەر (واتا: کێ دێ با بێ) ☰ ندا برای شرکت دادن بازیگران در بازی

**هەڵگوش / helguş/:** ناو. هەڵکوش؛ کاری گڵۆڤین؛ لێک گووشان و گۆڕینی بیچمی شتێک ☰ عمل فشُردن

**هەڵگوشان / helguşan/:** ☜ هەڵگوشین

**هەڵگوشین / helguşîn/:** چاوگ. هەڵکوشان؛ هەڵکوشین؛ هەڵگوشان؛ کوشین بە توندی ☰ فشُردن

**هەڵگوڵۆفان / helgułofan/:** چاوگ. هەڵگوڵۆفتن؛ هەڵگوڵۆفین؛ هەڵگڵۆفان؛ هەڵگڵۆفتن؛ هەڵگڵۆفین: ١. هەڵکوشین؛ هەڵگوشێن ٢. لە دەستا گوشین و فلیقاندنەوە ☰ ١. فشُردن ٢. در دست له کردن

**هەڵگوڵۆفتن / helgułoftin/:** ☜ هەڵگوڵۆفان

**هەڵگوڵۆفین / helgułofin/:** ☜ هەڵگوڵۆفان

**هەڵگۆزان / helgozan/:** ☜ هەڵگوازتن

**هەڵگۆزداگۆز / helgozdagoz/:** ناو. تاوتوو؛ کاری گوازتنەوەی شت لە دەفرێکەوە بۆ یەکی‌تر یا لە شوێنێکەوە بۆ شوێنی‌تر ☰ جابجایی

**هەڵگۆزین / helgozîn/:** ☜ هەڵگوازتن

**هەڵگۆستن / helgostin/:** چاوگ. هەڵگۆزین ☰ بالا کشیدن

**هەڵگوورین / helgûrîn/:** ☜ هەڵگوازتن

**هەڵگووزان / helgûzan/:** چاوگ. هەڵگووزانن؛ هەڵتۆزان ☰ رمیدن و جُفتک پراندن

**هەڵگووزانن / helgûzanin/:** ☜ هەڵگووزان

**هەڵگەڕان / helgeřan/:** چاوگ. ١. بۆ ژووری شتێ یان دیاردیەک چوون/ کشان؛ هەڵچوون (بە دار و بلندیدا) ‹فرانی و بە دارا هەڵگەڕا/ کوردە ئارامی لێ بڕا! «پیرەمێرد»› ٢. ڕەنگ گۆڕان؛ لە ڕەنگێکەوە بە ڕەنگێکی تر دەرهاتن ‹... هەمووی بە ڕۆندک و ئەسرینی گەش و ئاڵی بێوەژنی بابان‌وێران و ... ڕەنگابوون و سوور هەڵگەڕابوون ... «هەژار، *شەرەفنامە*»› ٣. بریان و خراپ بوون (وەک: شیر لە کولاندا) ‹شیرەکە داگەڕە! هەڵنەگەڕێ› ٤. داگەڕان؛ پڕ لە دمەڵ و زیپکە بوونی پێست ‹لەشی بە زیپکان هەڵگەڕاوە› ☰ ١. بالا رفتن از بلندی ٢. تغییر رنگ دادن ٣. بریدن و خراب شدن (مانند: شیر هنگام جوشیدن) ۴. پُرجوش و دُمل شدن پوست

**هەڵگەڕاندن / helgeřandin/:** چاوگ. ١.

وەرگەڕاندن ٢. بەرەو ژوور سووڕاندن ٣. بەرەو ژوور بردن ‹پەز هەڵگەڕێنە چیا!› ☰ ١. واژگون کردن ٢. به بالا چرخاندن ٣. صعود دادن

**هەڵگەڕاندنەوە / hełgeřand(i)newe/**: چاوگ. هەڵگەڕاننەوە؛ هەڵگێڕاندنەوە؛ هەڵەوگەڕانن؛ هەڵەوگەڕاننەوە: ١. وەرگێڕان؛ ژێروژوور کردن ‹تەشتەکەی هەڵگەڕاندەوە، چی تێدا نەبوو!› ٢. /کنایە/ پەژیوان کردنەوە ‹لە دینیان هەڵگەڕاندەوە› ٣. کێلانی دەخڵ و لەناو بردنی کشتوکاڵێ کە هەڵیخستووە ٤. وەرگەڕاندنەوە؛ بردنەوەی کەس یا شتێک بۆ شوێنی پێشووی ‹هەڵمانیگەڕاندەوە، بۆ ماڵێ› ٥. دانەوە؛ پێ دانەوە ‹پاش ساڵێ، پارەکەی هەڵگەڕاندەوە› ٦. وەرگێڕان؛ پاچڤە کردن ‹هەڵگەڕاندنەوەی شیعر بە زمانی کوردی› ٧. وەگەڕاندن؛ وەرچەرخاندن؛ لای شتێک گۆڕان ‹سەری هەڵگەڕاندەوە› ☰ ١. زیرورو کردن ٢. پشیمان کردن ٣. شخم زدن و از بین بردن محصول نارس ٤تا٧. برگرداندن

**هەڵگەڕاننەوە / hełgeřannewe/**: ☜ هەڵگەڕاندنەوە

**هەڵگەڕانەوە / hełgeřanewe/**: چاوگ. هەڵگەڕیانەوە؛ هەڵەوگەڕان؛ هەڵەوگەڕیان: ١. ژێروڕوو بوون ٢. /کنایە/ پەشیمان بوونەوە ‹لە قسەی خۆیان هەڵگەڕانەوە› ٣. /کنایە/ تۆقین؛ زراو چوون ☰ ١. زیرورو شدن ٢. پشیمان شدن ٣. وحشت کردن

**هەڵگەڕاو / hełgeřaw/**: ئاوەڵناو. گەڕاوە: ١. بزرکاو؛ بروسقیاو (وەک: شیر و ...) ٢. داگەڕاو؛ پڕ لە دمەڵ و زیپکە ٣. داقناو بە ئەسپێ و مێروو ☰ ١. بُریده (شیر) ٢. پر از دمُل و جوش ٣. پُر از حشره

**هەڵگەڕاوە / hełgeřawe/**: ئاوەڵناو. هەڵەوگەڕیاگ: ١. ژێروڕووکراو ٢. پێچەوانە ☰ ١. زیرورو ٢. وارونە

**هەڵگەڕیاگەوە / hełgeřyagewe/**: ئاوەڵناو. ١. هەڵەوگەڕیاگ؛ هەڵگەڕاوە ٢. ڕوووەرگێڕ؛ لە دۆستی پەشیمان ☰ ١. زیرورو ٢. روگردان

**هەڵگەڕیانەوە / hełgeřyanewe/**: ☜ هەڵگەڕانەوە

**هەڵگەواشتن / hełgewaştin/**: ☜ هەڵگوازتن

**هەڵگیران / hełgîran/**: چاوگ. هەڵگیریان: ١. ڕاگیران؛ لە ژێر چاوەدێری بوون ‹بردیمانە سەیری مووزە. یەکجار زۆر ئاسەواری نیزامی لە خەتی و چاپی زۆر بە قیمەت تێدا هەڵگیراوە «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. شاردرانەوە؛ شاریانەوە ٣. ڕفیان (ژن) ٤. لە زەوی بڕان؛ بەرز بوونەوە ‹کە هەڵگیرا جەنازەی، بوو بە مەحشەر دەشتی سەرقەبران/ لە بەر گریان و قوڕ پێوان و واوەیلا و عەشاماتێ «بێخود»› ٥. وەلا نران؛ پێچرانەوە ‹کەی بێ دووبەرەکی لە نێو کورددا هەڵگیرێ› ☰ ١. نگهداری شدن ٢. پنهان شدن (بە وسیلەی کسی) ٣. ربودە شدن (زن) ٤. برداشته شدن ٥. منسوخ شدن

**هەڵگیراو / hełgîraw/**: ئاوەڵناو. هەڵگیریاگ: ١. داندراو بۆ ئاگا لێ بوون ٢. شاردراوە ٣. ڕەوێنراو (ژن) ٤. بەرزەوەکراو ☰ ١. نگهداری شده ٢. پنهان کرده ٣. ربوده شده (زن) ٤. برداشته شده

**هەڵگیرسان / hełgîrsan/**: چاوگ. هەڵگرسان؛ پێ بوون (ئاگر) ‹کە گەییە زاتی باری، نووری بێچوونی لە سەر باری/ کە هەڵگیرسا، بە دەوری شەمعی خۆیا بوو بە پەروانە «مەحوی»›. هەروەها: **هەڵگیرساندن؛ هەڵگیرساندنەوە؛ هەڵگیرسانەوە** ☰ برافروختن؛ شعلەور شدن

**- هەڵگیرسێن / -hełgîrsên/**: پاشەوشە. ـ هەڵکەر؛ ـ داگرسێن ‹سەرم شێواوی شێوەی فیتنەهەڵگیرسێنی شۆخێکە/ حەواسم تەفرەقەی عیشوەی دڵناشووبێکی عەییارە «مەحوی»› ☰ ـ افروز

**هەڵگیریاگ / hełgîryag/**: ☜ هەڵگیراو

**هەڵگیریان / helgîryan/**: ☜ **هەڵگیران**

**هەڵگێران / helgêřan/**: چاوگ. وەرگێران؛ نخوون و سەروژێر کردن ☰ زیرورو کردن

**هەڵگێراندنەوە / helgêřand(i)newe/**: ☜ **هەڵگەڕاندنەوە**

**هەڵگێرانەوە / helgêřanewe/**: چاوگ. ١. هەڵگەڕاندنەوە؛ وەرگەڕاندنەوە؛ ژێروبان کردن ‹دەبینی یەک ئەوە مەشغوولی هەڵگێرانەوەی بانە/ ئەوەیتر دادەمەزرێنێ پلووسک و چۆتە گوێسوانە «هێمن»› ٢. پەشیمان کردنەوە ☰ ١. برگرداندن؛ زیرورو کردن ٢. پشیمان کردن

**هەڵگێڕ و وەرگێڕ / helgêř û wergêř/**: ناو. بان و خوار ‹مشتە تۆوی دانەوێڵەی چاکە شک نابەم کەچی/ دائیمەن هەڵگێڕ و وەرگێڕی ئەکەم وەردی گوناح «بێخود»› ☰ بالاوپایین

**هەڵگێڕوەرگێڕ / helgêřwergêř/**: ناو. هەڵگێڕوەڵگێڕ: ١. کاری ژێروڕوو کردن ٢. *[کینایە]* چۆنیەتی جووڵانەوە ‹تەواو پیر بووە، ناتوانێ هەڵگێڕوەرگێڕ بکا›. هەروەها: **هەڵگێڕوەرگێڕ پێکردن** ☰ ١. عمل زیرورو کردن ٢. جنبش و تحرک

**هەڵگێڕوەڵگێڕ / helgêřwelgêř/**: ☜ **هەڵگێڕوەرگێڕ**

▪ **هەڵگێڕەوە / helgêřewe/**: پاشەوشە. ـ هەڵەوگەڕ؛ ـ وەرگەڕێن ☰ ـ برگردان

**هەڵلووشان / hellûşan/**: ☜ **هەڵلووشین**

**هەڵلووشران / hellûşran/**: چاوگ. لووشیای ☰ سرکشیده شدن

**هەڵلووشین / hellûşîn/**: چاوگ. هەڵلووشان: ١. دەم پێوەنان و خستنە ناو گەروو بە مژین ‹وەک هەژدیها هەڵیلووشی!؛ ئەو گشت شۆربایەی هەڵلووشی!› ٢. هەڵکێشانە سەرێ ‹هەندێ جار رووی خۆی بە شاڵ ئەپۆشێ/ لە گوێ ئاگردان چڵم هەڵئەلووشێ! «پیرەمێرد»› ☰ ١. سر کشیدن ٢. بالا کشیدن

**هەڵلووشینەوە / hellûşînewe/**: ☜ **هەڵسڕین**

**هەڵلەرزین / hellerzîn/**: چاوگ. زۆر لەرزین (لە سەرمان و ترسان) ☰ لرزیدن (از سرما یا ترس)

**هەڵلا[1] / hella/**: ناو. ١. هەرا و زەنازەنا ‹هەموو پێچەکلوری بەفرێ ئایەی خوای لەگەڵدایە/ فریشتە کەوتە ناومان، بۆیە وا ئاشووب و هەڵلایە «پیرەمێرد»› ٢. گەرمی و هەرای داوەت و زەماوەند ☰ ١. غوغا و هنگامە ٢. شلوغی جشن و پایکوبی

▣ **هەڵلا بردن**: بەرەو ژوور بردن ☰ رو بە بالا بردن

**هەڵلا چوون**: بەرەو ژوور چوون؛ پێ هەڵگەڕان ‹بە دار هەڵلا چوو› ☰ بالا رفتن

**هەڵلا کێشان**: هوو لێ کردن؛ دەنگی نارەزایەتی دەربڕین ‹ڕێوی چووە ناو ڕێویان/ لێیان کرد بە هەڵلا کێشان «پیرەمێرد»› ☰ هُو کردن

**هەڵلا[2]**: ئاوەڵکار. بەرەوژوور؛ ڕووەو سەر ☰ رو بە بالا

**هەڵلا[3]**: دەنگەناو. ١. وتەی سەیرمان و پەسند کردن ‹هەڵلا لەو هەموو جوانییە!› ٢. لرفەی خواردن ☰ ١. وَه ٢. نچ و نوچ خوردن

**هەڵلاجۆ / hellaco/**: ناو. جۆلانێ؛ دیلەکانێ ☰ تاب

**هەڵلاداد / helladad/**: ناو. ڕەوتی لە بەین چوون؛ نەمان و فەوتان ‹ماڵەکەیان هەڵلاداد کرد› ☰ فرایند نابود شدن

**هەڵلادۆشە / helladoşe/**: ناو. حندرحۆ ☰ آلاکُلنگ

**هەڵلاقووچکە / hellaqûçke/**: ئاوەڵناو. هەڵلاقووچە؛ لە سەر یەک هەڵچنراوی بەرزەوەبوو ☰ انباشته

**هەڵلاقووچە / hellaqûçe/**: ☜ **هەڵلاقووچکە**

**هەڵلا ـ هەڵلا / hella halla/**: دەنگەناو. ١. وتەی زۆر لێ خۆش‌هاتن ‹هەڵلا ـ هەڵلا چەند شەوێکی خۆش بوو!› ٢. هەرا و چەقە؛ هەرا ـ هەرا؛ زەنا ـ

زەنا ‹دە بلا لە بەر هەلات ـ هەلاتی دە سواران، تەمال ــ تەمالی وە تاجیان، نرکەی دە بۆر محەندەکان، هەلـلا ـ هەلـلای دە کورەبەبان وەک نەمێنم دە بلا ... «*پایزە*»› ☰ ١. وە ـ وە ٢. جنجال و غوغا

**هەڵم / hel(i)m/**: ناو. ١. هلم؛ هولم؛ بۆخ؛ بۆق ‹چەرخی ماکینەی ئەم ڕۆژ و شەوە/ بێ هەڵم و بەنزین ئەسووڕێتەوە «پیرەمێرد»› ٢. هەڵمەت؛ توانا؛ هێز ‹گابۆر زۆر بەهێز و هەڵمە› ☰ ١. بُخار ٢. توانایی

**هەڵمات / helmat/**: ناو. کەلا؛ مەڕمەڕ؛ تیلە ☰ تیلە

**هەڵماتان / helmatan/**: ناو. هەڵماتانێ؛ هەڵماتێن؛ کەلایێن ☰ تیلەبازی

**هەڵماتانێ / helmatanê/**: ☜ هەڵماتان

**هەڵماتین / helmatîn/**: ☜ هەڵماتان

**هەڵماتێن / helmatên/**: ☜ هەڵماتان

**هەڵماس / helmas/**: ☜ ئەڵماس

**هەڵماسان / helmasan/**: چاوگ. قەدان؛ پەنەمانی زگ ☰ آماسیدن شکم

**هەڵماسیان / helmasyan/**: ☜ هەڵماسین

**هەڵماسین / helmasîn/**: چاوگ. هاوسان؛ هەلاماسین؛ هەلامسان؛ هەلامسین؛ هەلاوسان؛ هەڵماسیان؛ هەڵمسان؛ فرە ئەستوور بوون ☰ آماسیدن

**هەڵماسیو / helmasîw/**: ئاوەڵناو. هەلامساو؛ هەلامسیو؛ هەلاوساو؛ هەڵمساو؛ زۆر ئەستوور بووگ؛ زۆر پەنەماو ☰ آماسیده

**هەڵمالان / helmałan/**: ☜ هەڵماڵران

**هەڵمالاو / helmaław/**: ☜ هەڵماڵراو

**هەڵماڵدران / helmałd(i)ran/**: ☜ هەڵماڵران

**هەڵماڵدراو / helmałd(i)raw/**: ☜ هەڵماڵراو

**هەڵماڵران / helmałran/**: چاوگ. هەڵمالان؛ هەڵمالیان؛ هەڵماڵدران: ١. بەرەو ژوور بران (وەک پەردە و دەلینگ و قۆڵ و ...) ‹قۆڵی هەڵماڵرابوو› ٢. خزین و لێبوونەوە ‹گوریسەکە هەڵماڵراوە؛ پەتەکەی لێ هەڵماڵراوە› ٣. *[مەجاز]* شەرم شکان ‹ڕوو هەڵماڵران› ☰ ١. بالا رفتن؛ ورمالیده شدن (آستین، پاچەی شلوار و...) ٢. خزیدن و باز شدن (باربند و...) ٣. برکشیدن؛ پررو شدن

**هەڵماڵراو / helmałraw/**: ئاوەڵناو. هەڵمالاو؛ هەڵماڵدراو: ١. داخزاو و کراوە (وەک: قەفی گوریس) ٢. هەڵکراو (پەردە و قۆڵ و دەلینگ) ٣. شەرمشکاو ‹ڕووی لە ئێمە تەواو هەڵماڵراوە› ☰ ١. لغزیده و باز شده (گره) ٢. ورمالیده ٣. شرم ریخته

**هەڵماڵیان / helmałyan/**: ☜ هەڵماڵران

**هەڵماڵین / helmałîn/**: چاوگ. ١. هەڵکردن (پەردە و قۆڵ و دەلینگ) ‹لەوی دواوە دەبێ قۆڵی هەتا ئانیشکی هەڵماڵێ/ هەموو ڕۆژێ هەتا ئێواری بچتە جووت و جۆماڵێ «هێمن»› ٢. لێخزاندن (گرێ و قولفە) ٣. بۆ بالا هەڵکێشان ‹خۆڵی تەنوورەکە هەڵماڵە!› ٤. دەردان و خاوێن کردنەوە (جۆگەلە و ئەستێر لە قوڕ و لیتە و وردە چیلکە و گەلا) ٥. *[کینایە، پلار]* ماشتنەوە؛ بە لەز خواردن و هیچ نەهێشتنەوە ‹قاپێ برنجی هەڵماڵی!› ☰ ١. ورمالیدن ٢. لغزانیدن و باز کردن (گره) ٣. برکشیدن ٤. کفمالی کردن ٥. بالا انداختن

**هەڵماو / helmaw/**: ناو. ئاوێ کە لە داتکانی بۆخەوە پەیدا دەبێ ☰ آب مُقطر

**هەڵمرووسین / helm(i)rûsîn/**: ☜ هەڵمروویسین

**هەڵمروویستن / helm(i)rûy(i)stin/**: ☜ هەڵمروویسین

**هەڵمروویسین / helm(i)rûy(i)sîn/**: چاوگ. هەڵمرووسین؛ هەڵمروویستن؛ هەڵمژین ☰ برمکیدن

**- هەڵمژ / helmij/**: پاشەوشە. ــ مژەر؛ مژلێدەر ‹خوێنهەڵمژ› ☰ مکنده

**هەڵمژاردن** / helm(i)jardin/: چاوگ. هەڵبژاردن ☰ برگزیدن

**هەڵمژان** / helm(i)jan/: ☜ هەڵمژین

**هەڵمژتن** / helmijtin/: ☜ هەڵمژین

**هەڵمژەک** / helm(i)jek/: ناو. ئامرازی ئاو بەر دانە سەر ئاودەس ☰ سیفون

**هەڵمژین** / helm(i)jîn/: چاوگ. هەڵمژان؛ هەڵمژتن؛ هەڵمشتن: ١. لە ڕێگەی لووتەوە بردنە ناو دەروون ‹هەوا هەڵمژە؛ بۆنی هەڵمژە› ٢. لە ئاو و تەڕاییدا خووسان؛ ئاو و شێ کێشانە ناو خۆ ‹لۆکە ئاو هەڵدەمژێ› ٣. مژین؛ هەڵکێشانی تراو بۆ ناو دەم ☰ ١. استنشاق کردن ٢. جذب کردن رطوبت ٣. مکیدن

**هەڵمسان** / helm(i)san/: ☜ هەڵماسین

**هەڵمساندن** / helm(i)sandin/: چاوگ. هەڵامساندن؛ ئاوساندن ☰ متورّم کردن

**هەڵمساو** / helm(i)saw/: ☜ هەڵماسیو

**هەڵمساوی** / helmisawî/: ناو. پەنام؛ ماس؛ با؛ ئەستووری؛ دۆخ یان ڕەوتی ماسین ☰ آماس

**هەڵمشتن** / helmiştin/: ☜ هەڵمژین

**هەڵملیسیان** / helm(i)lîsyan/: ☜ هەڵملیسین

**هەڵملیسین** / helm(i)lîsîn/: چاوگ. هەرملیسین؛ هەڵملیسیان؛ هەڵمیستن؛ هەڵمیسین؛ لێو لێ توند کردن و هەڵمژین ☰ مکیدن

**هەڵموهەوڵ** / helm û hewł/: ناو. کردوکاش؛ کردوکۆش؛ داکۆکی؛ خەبات ☰ کار و بلاش

**هەڵمەت** / helmet/: ناو. ١. هۆمەن؛ هەلامەت؛ پەلامار؛ هجووم؛ شالاو ‹هەڵمەت ئەهێننە سەر دڵی ڕێشم بە ڕۆژ و شەو/ ئەویان بە تیر و شیر و ئەمی‌تر بە نیشەوە «شاهۆ بیارەیی»› ٢. دەستوبرد؛ تەکان ‹خەمی ولاتی دەر نەکا لە بیر/ بە هەڵمەت لاو بێ، پیر بێ بە تەدبیر «قانع»› ☰ ١. حمله ٢. اقدام

⊡ **هەڵمەت بردن**: شالاو بردن ☰ حمله بردن

**هەڵمەت دان**: پەلامار دان ☰ حمله کردن

**هەڵمەتدەر** / helmetder/: ناو. شالاوبەر ☰ مهاجم

**هەڵمەتەکاسە** / helmetekase/: ناوەڵناو. *[پەلار]* زۆرخۆری زگ لەوەڕێن ☰ انگل شکمباره

**هەڵمەتێ** / helmetê/: ناوەڵکار. ساتێ؛ تاوێ؛ ماوەیەکی کورت ‹هەڵمەتێ چوومە کۆمەکیان› ☰ لختی

**هەڵمەقۆ** / helmeqo/: ناو. ١. بازەڵێن؛ قەمچان؛ جۆرێ گەمە بە چەو ٢. جۆلانە؛ دێلەکانێ ☰ ١. یەقُل‌دوقُل ٢. تاب

**هەڵمەقووت** / helmeqût/: ناو. ١. حەپەنۆش؛ کاری بە یەکجاری قووت دان ‹هەر بە گەرمی هەڵمەقووتی کرد!› ٢. کاری بە بێ گوێ دان لە حەلال و حەرام، خواردن ☰ ١. عمل سرکشیدن ٢. عمل بالا کشیدن

**هەڵمەقووتە** / helmeqûte/: ناو. بالابەرزە؛ تلیا ناوی؛ زەڕنەقووتە ☰ انگشت وسطی

**هەڵمەلە** / helmele/: ☜ هێرۆ

**هەڵمیزان** / helmîzan/: ☜ هەڵمیزتن

**هەڵمیزتن** / helmîztin/: چاوگ. هەڵمیزان؛ هەڵمیستن؛ بە پێوە میز کردن ☰ ایستاده شاشیدن

**هەڵمیستن** / helmîstin/: چاوگ. ١. ☜ هەڵملیسین ٢. ☜ هەڵمیزتن

**هەڵمیسین** / helmîsîn/: ☜ هەڵملیسین

**هەڵنان** / helnan/: چاوگ. ١. دەبەر چاو گرتن ‹کارێکم هەڵناوە بۆی دەچم› ٢. هەڵدان؛ پێدا هەڵدان؛ پەسن دان ٣. هەڵپێچان؛ زۆر بۆ هێنان ‹هەڵیناوم ژنی بۆ بخوازم!› ٤. هان/ دنە دان ‹نەوسی هەڵیناوە، خۆی ناپارێزێ!› ٥. هەڵپەساردن ‹ڕێ و بان دەبەستێ بە بەفر هەموو/ لە بەر پەساران هەڵدەنێ ڕنوو «هێمن»› ٦. بردنە ژووری باڵندەی ماڵی ‹ئێوارێ مریشکەکانم هەڵنا› ٧. هەڵگرتن ‹هەنگاو هەڵنان› ☰ ١. در نظر گرفتن

٢. مدح کردن ٣. فشار آوردن ۴. برانگیختن ۵. تکیه دادن ۶. به لانه بردن پرندگان خانگی ٧. برداشتن

**هەڵناوین** / helnawîn/: چاوگ. ١. هەڵمالین بەرەو سەرەوە ‹هەڵناوینی خۆڵی ئەم تەنوورە چەندی تێ ئەچێ؟› ٢. لکانی چەوری بە ئاسمانەی دەمدا ☰ ١. بالا کشیدن ٢. چسبیدن چربی به کام دهان

**هەڵنج** / helinc/: ☜ **هێڵنج**

**هەڵنگ** / heling/: ☜ **هەڵۆ**

**هەڵنگفتن** / helingiftin/: ☜ **هەڵەنگوتن**

**هەڵنواڕین** / heln(i)warîn/: چاوگ. هەڵڕوانین ☰ به بالا نظر کردن

**هەڵنۆشین** / helnoşîn/: چاوگ. یەکجێ وەخواردن ☰ یکباره سرکشیدن

**هەڵنووتن** / helnûtin/: چاوگ. هەلنگافتن ☰ سکندری خوردن

**هەڵنووزان** / helnûzan/: چاوگ. نووزەنووز کردن بە زەلیلی ☰ لابه و زاری کردن

**هەڵنیشتن** / helnîştin/: چاوگ. نیشتن/ نیشتنەوەی پەلەوەر ‹مورغی عەرش لە جێی خۆی هەڵنیشتبوو/ دیار بوو ماندوێتی ڕۆژی چێشتبوو «پیرەمێرد»› ☰ برنشستن پرنده

**هەڵوا** / helwa/: ناو. حەلوا؛ هەروا؛ هەلاو؛ هەلبا؛ هێولا؛ شیوی دۆشاو و ئارد و ڕۆن ☰ حلوا

▣ **هەڵوای سەرپنج** *[کنایە، پلار]* گووی سەگ ‹هەڵوای سەرپنجێ یان گووی نێرە قنجێ؟! «مەسەل»› ☰ گُه سگ

**هەڵوارتە** / helwarte/: ناوەڵناو. هەڵبژاردە؛ ناوازە ☰ برگُزیده

**ـ هەڵواس** / helwas/: پاشەوشە. هەڵواسیو ‹خۆهەڵواس› ☰ ـآویز

**هەڵواسان** / helwasan/: چاوگ. وەش کەردش ☰ آویزان شدن

**هەڵواستن** / helwastin/: ☜ **هەڵواسین**

**هەڵواسران** / helwasran/: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //هەڵواسرای؛ هەڵدەواسریی؛ هەڵواسرێ// هەڵاوەسران ☰ آویزان شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: هەڵواسراو/ چاوگی نەرێنی: هەڵنەواسران

**هەڵواسراو** / helwasraw/: ناو. هەڵاوەسراو ☰ آویخته

**هەڵواسین** / helwasîn/: چاوگ. تێپەڕ. //هەڵتواسی؛ هەڵدەواسی؛ هەڵواسە// هلاڤیشتن؛ هەڵاواستن؛ هەڵاواسین؛ هەڵاوەستن؛ هەڵاوەسین؛ هەڵاویستن؛ هەڵواستن؛ هیلاویستن؛ دالەقاندن ☰ آویختن؛ آویزان کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: هەڵواسیو/ چاوگی نەرێنی: هەڵنەواسین

**هەڵوافرۆش** / helwaf(i)roş/: ناو. حەلواچی ☰ حلوافروش

**هەڵوایی** / helwayî/: ئاوەڵناو. شیرین وەک هەڵوا ☰ حلوامانند

**هەڵوڕین** / helw(i)řîn/: ☜ **هەڵبڕین ـ١**

**هەڵوژارتن** / helw(i)jartin/: چاوگ. هلاوارتن؛ ناپێویست و پێویست لێک‌جیا کردنەوە ☰ جدا کردن اشیاء لازم و غیرلازم

**هەڵوژەڕەشە** / helujeřeşe/: ناو. قەرەڵوو؛ قەرەڵی ☰ آلو سیاه

**هەڵوەدا** / helweda/: ئاوەڵناو. ئەڵوەدا: ١. تەرە؛ ئاوارەی دەشت و کێو ٢. هەڵاتوو؛ ڕاکردوو ‹هەڵوەدام و کەیلە دڵ بۆ دیتنی کوێستانەکەم/ تاسەبارم، تاسەباری خاکی کوردستانەکەم «؟»› ☰ ١. آواره ٢. متواری

**هەڵوەدایی** / helwedayî/: ناو. ئاوارەیی ☰ آوارگی

**ـ هەڵوەر** / -helwer/: پاشەوشە. ـ وەر؛ ـ بوەر ‹زووهەڵوەر› ☰ ـ ریز

**هەڵوەران / hełweran/**: ☜ **هەڵوەرین**

**هەڵوەراندن / hełwerandin/**: چاوگ. هلوەراندن؛ لە سەرەوە وەشاندن یان ڕژاندنە خوارەوە ‹لێم گەڕێن با دەربڕم سۆزی دەروون/ لێم گەڕێن با هەڵوەرێنم ئەشکی ڕوون «هێمن»› ☰ فروریختن

**هەڵوەراو / hełweraw/**: ☜ **هەڵوەریو**

**هەڵوەرین / hełwerîn/**: چاوگ. هەڵوەران؛ داوەرین ‹هەڵوەرێ پەڕەی گوڵ و نەسرینت/ لە جێی گوڵ، دڕک دەرکا زەمینت! «بێکەس»› ☰ فروریختن

**هەڵوەریو / hełwerîw/**: ناو. هەڵوەراو؛ هلوەراندی؛ داوەریو ‹تۆکل هەڵوەریو ڕزاو و پواو/ کرمەڕێز و وشک ئەعزای ساغ نەماو «قانع»› ☰ فروریخته

**هەڵوەڕوو / hełweřû/**: ☜ **هاوڵەڕوو**

**هەڵوەزان / hełwezan/**: ☜ **هەڵبەزین**

**هەڵوەزانەوە / hełwezanewe/**: ☜ **هەڵبەزینەوە**

**هەڵوەزنین / hełweznîn/**: چاوگ. هەڵوێزنین؛ کۆ کردنەوە و گلۆلە کردن (بەن و گوریس و...) ☰ گلوله کردن (نخ و...)

**هەڵوەزین / hełwezîn/**: ☜ **هەڵبەزین**

**هەڵوەزینەوە / hełwezînewe/**: ☜ **هەڵبەزینەوە**

**هەڵوەژارتن / hełwejartin/**: ☜ **هەڵوەژاردن**

**هەڵوەژاردن / hełwejardin/**: چاوگ. هەڵوەژارتن: ١. لێک جیا کردنەوە ٢. ڕێکوپێک کردن ‹ماڵەکەی هەڵوەژارت› ☰ ١. از هم جدا کردن ٢. مُرتب کردن

**هەڵوەژێران / hełwejêran/**: چاوگ. ١. لێک جیاوە بوون ٢. ڕێکوپێک بوونەوە ☰ ١. از هم جدا شدن ٢. مُرتب شدن

**هەڵوەژێراو / hełwejêraw/**: ناوەڵناو. ١. لێک جیاوە کراو ٢. ڕێکوپێک کراو ☰ ١. از هم جدا شده ٢. مُرتب شده

**هەڵوەس / hełwes/**: ☜ **هەڵبەست**

**هەڵوەسان / hełwesan/**: چاوگ. ڕاوەستان بە قیتەوە؛ قیت ڕاوەستان ☰ راست ایستادن -

**هەڵوەست / hełwest/**: ناو. ١. ☜ **هەڵبەست** ٢. ☜ **هەڵوێست**

**هەڵوەستان / hełwestan/**: چاوگ. هەڵوێسان؛ هەڵوێستان: ١. ڕاست و قیت ڕاوەستان ٢. بە دیار شتێکەوە وێستان ‹هۆگری بووبوو لای هەڵوەستابوو/ مەیموون شاگرد بوو دارتاش وەستابوو! «پیرەمێرد»› ☰ ١. راست ایستادن ٢. دور چیزی ایستادن

**هەڵوەستن / hełwestin/**: ☜ **هەڵبەستن**

**هەڵوەستە / hełweste/**: ☜ **هەڵبەستە**[١]

**هەڵوەشان / hełweşan/**: چاوگ. هەڵوەشیان؛ هلوەشیان؛ هلوەشین: ١. لە بەر یەک چوون ‹جاکەت هەڵوەشان› ٢. دڕانی جێ تەقڵ ٣. بەتاڵ بوونەوە؛ لە بایەخ کەوتنی دەستوور، بڕیار، قانوون یان پەسندنامە ‹حوکمی دادگای سەرەتایی هەڵوەشا› ☰ ١. از هم گسیختن ٢. پاره شدن دوخته ٣. باطل شدن

**هەڵوەشاندن / hełweşandin/**: چاوگ. هلوەشاندن؛ هەڵوەشانن: ١. لە بەر یەک بردن ‹خانووەکەمان هەڵوەشاند› ٢. دڕاندنەوەی تەقەڵ لێ دراو ‹درواوەکەی هەڵوەشاند› ٣. بەتاڵ کردنەوە؛ لە بایەخ خستنینی دەستوور، بڕیار، قانوون یان پەسندنامە ☰ ١. از هم گسیختن ٢. پاره کردن دوخته ٣. باطل کردن

**هەڵوەشاندنەوە / hełweşandinewe/**: چاوگ. بەتاڵ کردنەوە ‹بەرنامەی سەفەرەکەی هەڵوەشاندەوە› ☰ لغو کردن

**هەڵوەشانن / hełweşanin/**: ☜ **هەڵوەشاندن**

**هەڵوەشانەوە / hełweşanewe/**: چاوگ. پەک کەوتن؛ هلشیان؛ لە کار کەوتن؛ بێ کەڵک کەوتن ☰ از کار/ رونق افتادن

**هەڵوەشاو / heɫweşaw/**: ئاوەڵناو. هلوەشـیای: ١. لە بەر یەک چوو ٢. لە نێو چـوو ☰ ١و٢. برچیـده شده

**هەڵوەشیان / heɫweşyan/**: ☜ هەڵوەشان

**ـ هەڵوەشێن / heɫweşên/**: پاشەوشـە. ـــ تێکـدەر؛ لێک جیاوەکەر ‹بڕیارهەڵوەشێن› ☰ ـ گُسل

**هەڵوێ / heɫwê/**: ☜ هاوڵە

**هەڵوێزانن / heɫwêzanin/**: چاوگ. هەڵـکردنەوە؛ ماشەرە بەن کردنە گلۆڵە ☰ گلوگه کردن نخ

**هەڵوێزنان / heɫwêznan/**: ☜ هەڵوێزنران

**هەڵوێزناو / heɫwêznaw/**: ☜ هەڵوێزنراو

**هەڵوێزنـدران / heɫwêzind(i)ran/**: ☜ هەڵوێزنران

**هەڵوێزنـدراو / heɫwêzind(i)raw/**: ☜ هەڵوێزنراو

**هەڵـوێزنران / heɫwêzn(i)ran/**: چـاوگ. تێنەپـەڕ. نادیـار. //هەڵـوێزنرای؛ هەڵـدەوێزنرێی؛ هەڵـوێزنرێ// هەڵوێزنان؛ هەڵوێزندران؛ کـۆ و گلۆڵـە کـران ☰ گلوله شدن؛ گرد شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: هەڵوێزنراو/ چاوگی نـەرێنی: هەڵنەوێزنران

**هەڵوێزنراو / heɫwêzinraw/**: ئاوەڵناو. هەڵـوێزناو؛ هەڵوێزندراو؛ کۆکراوەی گلۆڵـەکراو (وەک بـەن و گوریس) ☰ جمع‌شده‌ی گلوله شده

**هەڵوێزنین / heɫwêznîn/**: ☜ هەڵوەزنین

**هەڵوێس / heɫwês/**: ☜ هەڵوێست

**هەڵوێسـان / heɫwêsan/**: چـاوگ. ١. ☜ هەڵوەستان ٢. کەنەفت بـوون و لـە کـار کـەوتن ‹کەرەکەیان شەکەت کرد، هەڵوێسـاگە› ☰ ١. ☜ هەڵوەستان ٢. از کار افتادن

**هەڵوێست / heɫwêst/**: ناو. هەڵوەست؛ هەڵـوێس: ١. وچـان؛ وێسـتانێکی کـەم ٢. هـزر و بـیر دەربـارەی شـتێ ‹سـەبارەت بـەم کارەسـاتە هەڵوێستی حیزبی ئێوە چییە؟› ☰ ١. توقف کوتاه ٢. موضع

**هەڵوێستان / heɫwêstan/**: ☜ هەڵوەستان

**هەڵـوێنی / heɫwênî/**: نـاو. ١. دەنکـە قەیسـی شیرین ٢. قەیسی دەنـک شـیرن ☰ ١. هستەی شیرین زردالو ٢. زردالوی هسته شیرین

**هەڵۆ / heło/**: ناو. هەڵـوو؛ ئـەلهۆ؛ ئـەیلۆ؛ هـولی؛ هەرۆ؛ ئەلوە؛ ئەلوھ؛ ئەلە؛ ئلـە؛ ولـە؛ ئلـهۆ؛ ئلهـە؛ ئەڵۆ؛ ئالۆ؛ ئەلوو؛ هکـور؛ هەڵـنگ؛ سـپر؛ کـورت؛ سەرکنەک: ١. ناوی گشتی تۆرەمەیەک باڵندەی ڕاوچین، دندووکیان کـورت و قەڵانگییـە، ملیـان کـورت، لاقیـان بـەهێز و تـووکن و چـڕنووکیان قەڵانگییە، زۆرتر تەنیا دەژین، گیانـەوەرانی وەک مشک، مار، باڵندە، بۆق و کرم دەخـۆن، بـریتین لە: بازەکان، داڵاشەکان؛ سەقرەکان، شمقارەکان و هەڵۆکان ٢. باڵندەیەکە لە خێزانی هەڵۆ سەر بە تۆرەمەیەک هەر بـەم نـاوە، دەوری ٧٥ تـا ٨٥ سانتی‌میتر دەبێ، سەر و باڵی قاوەیی ئاماڵڕەشە، سەر و پاش‌ملی زەردی کاڵە کە لە پیریدا سـپی هەڵدەگەڕێ، کلکی چوارسووچە، لە ئاسمان کـە لەنگەر دەبەستێ، باڵی لە ڕێکی لەشی ڕادەگرێ، لـە فڕینـدا ئارامـە، لـە سـەر داری بڵـیند و دوورەدەست هێلانەی گەورە ساز دەکا و تەمەنی لە سـی سـاڵ تێناپـەڕێ ☰ ١. عُقابیـان ٢. عُقـاب شاهی

▣ **هـەڵـۆی دوبـرا**: هەڵـۆی کـەوان؛ دووبـرا؛ وێنەیـەکی گـەردوونی گـەورە لـە ئاسمـانی نیوەگۆی باکووردا بە شێوەی هەڵـۆ ☰ عقـاب دوبرادر

**هەڵۆی کەوان**: ☜ هەڵۆی دوبرا

**هەڵۆدان / hełodan/**: ☜ هەڵدانەوە

**هەڵۆدڕین / hełod(i)řîn/**: ☜ هەڵدڕین

**هەڵۆک / hełok/**: ☜ هەڵۆرك

**هەڵۆڵ** / hełoł/: ☜ **هولۆڵ**

**هەڵۆنگ** / hełoňg/: ☜ **هەڵۆرک**

**هەڵۆهاوردن** / hełohawirdin/: ☜ **هەڵ‌هاوردنەوە**

**هەڵو** / hełû/: ☜ **هەڵۆ**

**هەڵوجە** / hełûce/: ☜ **هەڵوژە**

**هەڵوچکە** / hełûçke/: ناو. عەلووکەڕەشە ☰ آلوبُخارا

**هەڵوچە** / hełûçe/: ☜ **هەڵوژە**

**هەڵوچەڕەشە** / hełûçeřeşe/: ☜ **هەڵوژەڕەشە**

**هەڵوچەزەردە** / hełûçezerde/: ناو. زەرهەلی ☰ آلوی زرد

**هەڵوچەقەیسی** / hełûçeqeysî/: ناو. حەمشین؛ میوەیەکە لە جنسی قۆخ ☰ شلیل

**هەڵوژە** / hełûje/: ناو. ئەڵووجە؛ ئەڵووژە؛ هللۆ؛ هەلچە؛ هەڵووجە؛ هەڵووچە؛ هێرۆگە؛ ئاڵووچە؛ خالووت؛ حولچەک؛ حولووک؛ حولیچەک؛ حەلوو؛ حەلووچک؛ حەلووک؛ حەلووکە؛ عەلووکە: ١. دارچکێکی لق دڕکاوی لە تیرەی ئەڵووە ٢. میوەی سەبز و ترشی خۆراکی ئەو دارچکە ☰ ١و٢. آلوچە؛ آلو

**هەڵوژەڕەشە** / hełûjeřeşe/: ناو. ١. گلاز؛ گەلاز؛ هلورەشک؛ عەلووکە سوورەی پایزی ٢. فشنە؛ ئالووبوخارا ☰ ١. آلوی قرمز ٢. آلوبخارا

**هەڵوشە** / hełûşe/: ناو. گوڵێکە ☰ گُلی است

**هەڵوکی** / hełûkî/: ☜ **هەڵۆرک**

**هەڵولین** / hełûlîn/: چاوگ. لە ناو دەستا گلۆف کردن ☰ مُچاله کردن

**هەڵە**[1] / hełe/: ناو. ١. سەهو؛ غەڵەت ‹هەڵەم بپۆشە! نەچی گیف ببی لە سەرکۆنەم!/ بترسە ڕۆژێ ئەتۆش تەڕ ببی! مەڵێ سۆنەم! «هەژار، *شەرەفنامە*»› ٢. ئامرازی بێژانی کون‌درشت ☰ ١. غلط ٢. بیزن سوراخ دُرُشت

⊡ **هەڵە کردن**: سەهو کردن ☰ اشتباه کردن

**هەڵە گرتن**: دەسنیشان کردن و ڕاست کردنەوەی هەڵەی نووسراوەیەک ☰ غلط‌گیری کردن

**ڕێ هەڵە کردن**: ١. ڕێ گوم کردن؛ بە ڕێگای هەڵەدا چوون ٢. *[کینایە]* سەر لێ شێوان ☰ ١. راه گُم کردن ٢. گُمراه شدن

**هەڵە**[2]: ئاوەڵناو. نادروست؛ نەشیاو ‹کاری هەڵە هەرگیز مەکە!› ☰ غلط؛ نادرست

**هەڵەبار** / hełebar/: ئاوەڵناو. گوناهبار؛ گونابار ☰ گناهکار

**هەڵەباش** / hełebaş/: ئاوەڵناو. سڵ؛ تووڕە و قوشقی ☰ رموک

**هەڵەبژار** / hełebijar/: ناو. ڕاستکەرەوە؛ هەڵەی نووسراو لابەر ☰ نمونەخوان؛ مُصحح

**هەڵەپاس** / hełepas/: ئاوەڵناو. زۆروەڕ؛ تایبەتمەندی سەگێ کە زۆر و نابەجێ دەوەڕێ ☰ بسیار و بی‌جا پارس کننده

**هەڵەپرووکێ**[1] / hełep(i)řûkê/: ئاوەڵناو. پەلەپەل؛ بە هەڵپە ‹کاری هەڵەپرووکێ هەر بە کار نایێ› ☰ عجولانه

**هەڵەپرووکێ**[2]: ئاوەڵکار. بە پەلە و عەجەلە ‹هەڵەپرووکێ شتێکی نووسی› ☰ عجولانه

**هەڵەپلە** / hełep(i)łe/: ناو. پەلە؛ لەز ‹لە کارو باریدا زۆر هەڵەپلە دەکا› ☰ عجله

**هەڵەپەزە** / hełepeze/: ناو. قژقژە؛ پسپسەکۆڵە؛ مێروویەکی زەردی لە جسنی جۆڵاتەنە ☰ رُتیل

**هەڵەت** / hełet/: ناو. زەرد و ماهی زۆر سەخت ☰ پرتگاه

**هەڵەتانج** / hełetanc/: ناو. ئاڵەتاج؛ ئاڵەتانج؛ جۆرە مراوییەکی بەڵەکە، لە خێزانی قاز مراوی لە تۆرەمەی وەردۆک، دەوری ٦٠ سانتی‌میتر دەبێ، سەر و شابالی ڕەش و سینگ و دندووکی سوورە،

وەک قاز هەڵدەفڕێ، لە گۆل و ئاوی سوێردا دەژی، لە کون و قەڵشتە بەردان هێلانە دەکا ☰ تنجه

**هەڵەتە / hełete/**: ئاوەڵناو. پەڕیوە؛ تەرە ☰ آواره

**هەڵەخۆر / hełexor/**: ئاوەڵناو. پیس‌خۆر؛ گەنەخۆر؛ چەپەڵ‌خوەر ☰ گندەخور

**هەڵەخەرج / hełexerc/**: ئاوەڵناو. دەست‌بڵاو ☰ ولخرج

**هەڵەخەرجی / hełexercî/**: ناو. باش‌وبۆشی؛ دەس‌بڵاوی؛ ڕەوتی ماڵ بە فێرۆ دان ☰ ولخرجی

**هەڵەداوان / hełedawan/**: ناو. پەلەی زۆر ‹هەرسێکیان هێنا بە هەڵەداوان/ بە شپرزەیی گەینە بەر دیوان «پیرەمێرد»› ☰ شتاب؛ عجله

**هەڵەڕیزە / hełeřîze/**: ناو. ترێ‌مارانە؛ ڕەزڕەزۆک ☰ تاجریزی

**هەڵەسڕ / hełesiř/**: ناو. غەڵەتگیر؛ قەڵەم یا فلچەیێ بۆ پاک کردنەوەی نووسراوی هەڵە ☰ لاک غلط‌گیر

**هەڵەسو / hełesû/**: ناو. بابۆڵەی ڕۆن تێ‌ساوراو ☰ ساندویچ نان و روغن

**هەڵەسون / hełesûn/**: ناو. ڕەوتی دیسان سەوز بوونەوەی گیا پاش وشک بوون و دروون ☰ فرایند دوباره سبز شدن گیاه

⊡ **هەڵەسون هێنانەوە**: ١. لە سەرڕا سەوز بوونەوە ‹مێرگەکەم ئاودا هەڵەسوونی هێناوەتەوە› ٢. *[کینایە]* دیسان داوا کردنەوە ‹بەشم داوە دیسان هەڵەسوونی هێناوەتەوە› ☰ ١. از نو سبز شدن بعد از درو ٢. دوباره خواستن

**هەڵەشە / hełeşe/**: ئاوەڵناو. ١. بەپەلە و لەڕێ‌لادەر ٢. سەرەڕۆ؛ گوێ‌نەبیس* هەروەها:

**هەڵەشەیی** ☰ ١. عجول ٢. حرف‌نشنو

**هەڵەک / hełek/**: ناو. ئاڵقە ☰ حلقه

**هەڵەکار / hełekar/**: ئاوەڵناو. ١. کارخراپ ٢. سەهوکار ☰ ١. گندکار ٢. اشتباه‌کار

**هەڵەکاری / hełekarî/**: ناو. شاشیکاری ☰ اشتباهکاری

**هەڵەکوت / hełekut/**: ناو. گۆشتکوت؛ گۆشکوت ☰ گوشتکوب

**هەڵەکۆک / hełekok/**: ☜ **ناڵەکۆك**

**هەڵەکەسەما / hełekesema/**: ناو. سەماکەرە؛ مشک‌گرە؛ باڵندەیەکی ڕاوچییە لە خێزانی شەهێنەکان، لە تۆرەمەی هەڵۆ، نزیک ٣٠ تا ٣٥ سانتی‌میتر دەبێ، دوو جۆری گەورە و بچووکی هەیە ☰ دلیجه

**هەڵەگەڕ / hełegeř/**: ئاوەڵناو. گەڕیدەی سەرگەردان ☰ ولگرد

**هەڵەم / hełem/**: ناو. ١. نەخۆشی هەرزنەی ترێ ٢. هێشووی ترێ کە چەند دەنکی درشت و باقی وردن ‹پرسیم: ئەی هەڵەم! دانەت با هەڵەم/ بۆچ زەرد هەڵگەڕای بە دەردی وەرەم؟ «پیرەمێرد»› ☰ ١. بیماری شکوفەی انگور ٢. خوشەی انگور با چند حبەی درشت و مابقی ریز

⊡ **هەڵەم کردن**: وەرینی هەرزنەی ترێ ☰ ریختن شکوفەی انگور

**هەڵەمارکەر / hełemarker/**: ئاوەڵناو. پەلاماردەر؛ زاڵم؛ دەست‌درێژکەر ☰ تجاوزگر

**هەڵەموت[١] / hełemût/**: ناو. ئەڵەمووت؛ هەزاربەهەزار؛ هەلەم؛ زەرد و ماهی زۆر سەخت ‹هەڵەمووت بە لە ناو چیا!/ داربەڕوو بە لە ناو گیا! «هەژار، *چوار ناملکە*»› ☰ کوه دشوارگذر

**هەڵەموت[٢]**: ئاوەڵناو. ئەڵەمووت؛ هەزاربەهەزار؛ هەلەم؛ زۆر سەخت بۆ پێدا چوون ‹هەورامان ناوچەیەکی هەڵەمووت و بەردەڵانە› ☰ دشوارگذر

**هەڵەمور / hełemûr/**: ناو. ژیلەمۆ؛ زیلەمۆ ☰ خاکستر داغ

**هەڵەنامە / hełename/**: ناو. غەڵەت‌نامە؛

نووسراوەیێ کە بە ڕیز هەڵەکانی کتێب یان بەرهەمێکی تێدا ڕاست کراوەتەوە ☰ غلطنامه

**هەڵەنگوان / heɫeng(i)wan/:** چاوگ. سەرانگریێ بوون ☰ سکندری خوردن

**هەڵەنگواندن / heɫeng(i)wandin/:** چاوگ. سەرەنگریێ پێ کردن ☰ سکندری دادن

**هەڵەنگوتن / heɫengutin/:** ☜ **هەڵەنگووتن**

⊡ **دڵ لە کەسێ/ شتێ هەڵەنگوتن:** دڵ لە کەسێ/ شتێ هەڵکەفتن ‹نازانم چۆن بوو کە دڵم بەجارێ لە قومار هەڵەنگوت و بەبێ سوێند خواردن تەرکم کرد و لە بیر خۆم بردەوە «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ کسی/ چیزی دل را زدن

**هەڵەنگووتن / heɫengûtin/:** چاوگ. هەڵەنگوتن؛ هەڵنگفتن؛ هەڵەنگووفتن؛ سەرەنگریێ بوون ☰ سکندری خوردن

**هەڵەنگووتە / heɫengûte/:** ئاوەڵناو. سەرەنگریێ؛ ڕەتبردە ☰ سکندری خورده

**هەڵەنگووفتن / heɫengûftin/:** ☜ **هەڵەنگووتن**

**هەڵەوپەڵە / heɫe w peɫe/:** ناو. هەڵە و چەوتی لە نووسین و کاردا ‹پێم خۆشە هەڵەوپەڵەم بۆ ڕاست بکەنەوە› ☰ غلط و غلوط

**هەڵەودان / heɫewdan/:** ☜ **هەڵدانەوە**

**هەڵەوگەڕ / heɫewgeř/:** ☜ **هەڵگێڕەوە**

**هەڵەوگەڕان / heɫewgeřan/:** ☜ **هەڵگەڕانەوە**

**هەڵەوگەڕانن / heɫewgeřanin/:** ☜ **هەڵگەڕاندنەوە**

**هەڵەوگەڕاننەوە / heɫewgeřannewe/:** ☜ **هەڵگەڕاندنەوە**

**هەڵەوگەڕاو / heɫewgeřaw/:** ئاوەڵناو. بەراوپشت؛ سەرنخوون؛ بەراوەژوو؛ واژی؛ بەرەواژی ☰ واژگون

**هەڵەوگەڕیاگ / heɫewgeřyag/:** ☜ **هەڵگەڕاوە**

**هەڵەوگەڕیان / heɫewgeřyan/:** ☜ **هەڵگەڕانەوە**

**هەڵەونایەرە / heɫewnayere/:** چاوگ. داتۆلاندن؛ لەبەر یەک بردن بە هۆی زۆر کوڵاندنەوە ☰ لە کردن از پُختنِ بسیار

**هەڵەوەڕ / heɫeweř/:** ئاوەڵناو. ١. هەڵەپاس؛ حەپەکەری لە هیچ ‹مەیەڵن نەفام دەنگی دەربێنێ/ سەگی هەڵەوەڕ دزتان بۆ دێنێ! «پیرەمێرد»› ٢. ☜ **هەرەوەڕ** ☰ ١. بیجا پارس‌کُننده ٢. ☜ **هەرەوەڕ**

**هەڵەوەڕی / heɫewеří/:** ناو. چەنەچەن؛ زمان‌درێژی ☰ زبان‌درازی

**هەڵەوهاوردن / heɫewhawirdin/:** ☜ **هەڵهاوردنەوە**

**هەڵەویایەرە / heɫewyayere/:** چاوگ. داتۆلان؛ لەبەر یەک چوون بە هۆی زۆر کوڵانەوە ☰ لە شدن از بسیار پُختن

**هەڵەهەڵ / heɫeheɫ/:** ناو. قسەی بە پەلەپەل ☰ سخن با شتاب

**هەڵەیی / heɫeyî/:** ناو. هەڵەکاری ☰ اشتباه

**هەڵهاتگ / heɫhatig/:** ☜ **هەڵاتوو**[1]

**هەڵهاتن / heɫhatin/:** ☜ **هەڵاتن**

**هەڵهاتوو / heɫhatû/:** ☜ **هەڵاتوو**[1]

**هەڵهانین / heɫhanîn/:** ☜ **هەڵهێتان**

**هەڵهاوردن / heɫhawirdin/:** چاوگ. ١. ☜ هەڵهاوردنەوە ٢. ☜ **هەڵهێتان ـ٣**

**هەڵهاوردنەوە / heɫhawird(i)newe/:** چاوگ. هەڵاوردنەوە؛ هەڵۆهاوردن؛ هەڵەوهاوردن؛ هەڵهاوردن؛ ڕشانەوە ☰ استفراغ کردن

**هەڵهاوێتن / heɫhawîtin/:** ☜ **هەڵاوێژتن**

**هەڵهاوێشتن / heɫhawîştin/:** ☜ **هەڵاوێژتن**

**هەڵهێن**[1] **/ heɫhên/:** ناو. ئەوەی هێلکە ئەکاتە جووچک ☰ آنکه/ آنچه از تخم جوجه به عمل آورد

**هەڵهێن**[2]: ئاوەڵناو. ١. بڵندکەر؛ بەرزەوەکەر ٢. هێلکە بە جووچکەکەر ☰ ١. بُلندکننده ٢. عمل‌آور

جوجه

▪ **هەڵهێن**[٢]: پاشەوشە. ١. بەرزەوەکەر ‹سەرهەڵهێن› ٢. بە جووچکەکەر ‹هێلکەهەڵهێن› ٣. دۆزەر ‹مەتەڵهەڵهێن› ☰ ١. بُلندکننده ٢. عمل‌آورِ جوجه ٣. ـ گُشا

**هەڵهێنان** / hełhênan/: چاوگ. هەڵهانین؛ هەڵێنان: ١. کردنەوە (چاو و ...) ‹کە هەڵمانهێنا چاو لە خەوی خۆش/ گزنگی هەتاو دابووی لە کولۆش «گۆران»› ٢. بەرز کردنەوە (سەر و ...) ‹هەر سەری هەڵهێنا لیی دا!› ٣. هەڵهاوردن؛ جووچکە لە هێلکە دەرهێنان ‹وەک مریشکێ کە عەقلی نەیهێنێ/ بێت و هێلکەی مراوی هەڵبێنێ «حاجی قادر»› ٤. هەڵهاوردن؛ زانینی مەتەڵ ☰ ١. باز کردن (چشم و ...) ٢. بلند کردن (سر و ...) ٣. جوجه از تخم در آوردن ٤. حل کردن معما

**هەڵهێنجان** / hełhêncan/: ☜ **هەڵێنجان**

**هەڵی** / hełî/: ناو. زۆر بڵندی هەڵەت ☰ پرتگاه

**هەڵیت** / hełît/: لێل. ← **هەڵیتوپەڵیت**

**هەڵیتر** / hełîtir/: ناو. هەڵیترگ؛ کاروش؛ گیایەکی بەزاری بژارە ☰ گیاهی سمّی

**هەڵیترگ** / hełîtir(i)g/: ☜ **هەڵیتر**

**هەڵیتوپەڵیت** / hełît û pełît/: ناو. قسەی هیچ و پووچ و بێمانا ☰ شِرووِر

**هەڵیز** / hełîz/: ناو. هەڵیزە؛ مەشکە ☰ مَشک

**هەڵیزە** / hełîze/: ☜ **هەڵیز**

**هەڵیزەبڕە** / hełîzeb(i)ře/: ناو. مەشکەدڕە ☰ نوعی ملخ سیاه

**هەڵیژگ** / hełîjig/: ناو. گیایەکە، مێملی تووتنە، ولاخ بیخوا دەیتەقێنێ! ☰ گیاهی است

**هەڵیس** / hełîs/: ناو. پووش؛ هەلیز؛ وشکە گیا ☰ خس؛ علف خشک

**هەڵێن** / hełên/: ناو. جەک؛ ئامرازێکە بۆ بەرز کردنەوە ☰ جَک

**هەڵێنان** / hełênan/: ☜ **هەڵهێنان**

**هەڵێنانەوە** / hełênanewe/: چاوگ. ١. کولاندنەوەی دۆی مەشکە و تیژاوی پەنیر ٢. بلند کردنەوە ‹هەنگاو هەڵێنانەوە› ٣. بڕینی پارچە بۆ دروونی جل ‹نیفەکی دەرپێکە هەڵێنەوە!› ☰ ١. جوشاندن دوغ و آب پنیر ٢. باز برداشتن و بُلند کردن ٣. بُرش دادن پارچه برای دوختن لباس

**هەڵێنجان** / hełêncan/: چاوگ. هەڵهێنجان؛ بە دەفر (لە بیر و چاڵ) تراو هەڵکێشان ‹لە وشتەپە ئاومان لە بیرێکی زۆر قووڵ، بە سەتڵ و گوریس هەڵدەکێشا. جارێک لەو ئاو هەڵێنجانە، قرچە لە پشتمەوە هات و پشتم کووڕ بۆوە و ژانی زۆر گرانی دەکرد «هەژار، چێشتی مجێور»› ☰ برکشیدن؛ آهنجیدن

**هەم**[١] / hem/: ناو. *[کۆن]* غەم؛ خەفەت ‹ئێستەکە کوردە هەموو بێهەم و بێدەرد و خەمە/ شادە، ئازادە، دەکا گاڵتە و گەپ و کەیف و گەمە «هێمن»› ☰ غم؛ غُصه

**هەم**[٢]: ئاوەڵکار. ١. دیسان؛ وتەی دووبارە ‹شەفەق ساحیوماڵ هەم دەنگی دەرات/ پووپەکەو بگری بەس ک قووڵینی «شامی»› ٢. هەر؛ هەموو ‹هەم سەری چوو، هەم ماڵی!› ☰ ١. باز؛ دوباره ٢. هم

**هەم**[٣]: ئامراز. ١. وەک؛ ڕاست وەک ٢. وەکوو ‹من ئەو دیت هەم بازێرێ› ٣. هەروەها ‹هەم تۆم خۆش دەوێ هەم ئەو› ☰ ١. کاملاً ٢. مانندِ ٣. هم

**هەم ـ**[٤]: پێشگر. هام ـ هاو ـ ‹هەمکار؛ هەمباز› ☰ هم ـ

**هەما** / hema/: ئاوەڵکار. ١. ☜ **هێشتا** ٢. ئاوا ٣. ئەوسا ٤. ئیتر ☰ ١. ☜ **هێشتا** ٢. این‌طور ٣. آنگاه ٤. دیگر

**هەمار** / hemar/: ناو. ئەمار؛ ئەمبار؛ ئەنبار؛ عەمار؛ عەنبار؛ هامبار؛ همار؛ هەمبار؛ هەنبار؛ هۆمار؛ هومار؛ بارخانە؛ کۆمگە؛ کۆگە؛ مەکۆی کەل‌وپەل

▣ انبار

⊡ **هەمار کردن:** عەنبار کردن ▣ انبار کردن

**هەماراو / hemaraw/:** ناو. ئەماراو؛ ئاوئەنبار؛ عەنباراو؛ عەمباراو؛ حەوزی سەرداپۆشراو بۆ ئاو تێدا هەڵگرتن ▣ آب‌انبار

**هەمارەپۆ / hemarepo/:** ناوەڵناو. عەمارەپۆ؛ لە نێو هەماردا پواو ▣ پوسیده در انبار

**هەماز / hemaz/:** ناو. ١. منداڵدان ٢. ئاواڵ‌منداڵ ▣ ١. زهدان ٢. جُفت نوزاد

**هەماس / hemas/:** ناوەڵناو. هێمن؛ لەسەرخۆ ▣ آرام

**هەماگی / hemagî/:** ناوەڵکار. بە حاستەم و دووبەلا ▣ به سختی و آهستگی

**هەماڵکی / hemal(i)kî/:** ناوەڵناو. وەک حەنباڵان ▣ حمال‌آسا

**هەماڵیا / hemalya/:** ناو. حەماڵیانە؛ مزی حەنباڵی ▣ مُزد حمالی

**هەماڵ / hemał/:** ناو. ١. ☜ **حەماڵ** ٢. *[دابی کۆن]* حەمایل؛ نوشتەی دە بەرگ‌گیراوی دە لاشان‌کراو ٣. قایشێ کە بە کورتانەوە شۆڕ بۆتەوە ▣ ١. ☜ **حەماڵ** ٢. دعای نوشتەی حمایل شده ٣. تسمەی آویزان به پالان

**هەمان[١] / heman/:** ☜ **هەنبانە**

**هەمان[٢]:** ناوەڵناو. هەر ئەو؛ هەر ئان ‹خۆزگە بە هەمان سالی پێشوو؛ هەمان دەستوور› ▣ همان

**هەمان[٣]:** ناوەڵکار. ١. هەموان؛ گشت ٢. تەواو وەک؛ هەر ‹هەمان بریار دان و هەمان پشت گوێ خستنە!› ▣ ١. همگی ٢. عیناً

**هەمان[٤]:** جێناو. هەر ئەوە ‹لە نێو ئەو هەمووەدا هەمان هات کە چاوەنۆڕیم نەدەکرد› ▣ همان

**هەماندن / hemandin/:** چاوگ. کردنە پاوان؛ قۆرغ کردن؛ قەدەغە کردن ▣ ممنوع کردن

**هەمانە / hemane/:** ☜ **هەنبانە**

**هەمانهۆ / hemanho/:** ناوەڵکار. ئەوێستاکە؛ نکاین؛ هەر ئێستاکێ ▣ همین حالا؛ هم‌اکنون

**هەماواز / hemawaz/:** ناوەڵناو. هەمزار؛ هاوقسە ▣ هماواز

**هەماوەز / hemawez/:** ناوەڵناو. دە یەک ڕادە (لە عەقل و زانستدا) ▣ هم‌سطح (در خرد و دانش)

**هەمایل / hemayîl/:** ناو. ١. قایشی شمشێر بە خۆوە هەڵواسین کە دە ملی دەکەن ٢. *[دابی کۆن]* نوشتەی دەبەرگ گیراوی بە بەن‌کراو ▣ ١. حمایل شمشیر ٢. دُعای نوشتەی حمایل شده

**هەمبار / hembar/:** ☜ **هەمار**

**هەمباز / hembaz/:** ناو. هەواڵ؛ دۆست ▣ دوست

**هەمبازی / hembazî/:** ناو. هەواڵەتی ▣ دوستی

**هەمبازاڕی / hembajařî/:** ☜ **هەمبازێڕی**

**هەمبازێڕی / hembajêřî/:** ناو. هەمبازاڕی: ١. هاوشاری ٢. هاووڵاتی ▣ ١. همشهری ٢. **هموطن**

**هەمبان / hemban/:** ☜ **هەنبانە**

**هەمبانە / hembane/:** ☜ **هەنبانە**

**هەمبانەبۆرین / hembaneborîn/:** ☜ **هەنبانەبۆرینە**

**هەمبانەبۆرینە / hembaneborîne/:** ☜ **هەنبانەبۆرینە**

**هەمبانەگۆرینە / hembanegorîne/:** ☜ **هەنبانەبۆرینە**

**هەمبز / hembiz/:** ☜ **هامێز**

**هەمبس / hembis/:** ناو. ١. جۆرێ بزنی گوێ سوور ٢. دەخڵی شینی گێژدراوی تێک‌هاڵاو ▣ ١. نوعی بز گوش قرمز ٢. غلەی سبزه درهم آویخته

**هەمبەر / hember/:** ناوەڵناو. هەمبەر: ١. بەرانبەر ٢. ڕووبەڕوو ▣ ١. برابر ٢. روبرو

**هەمبەرگر / hembergir/:** ناو. هەمبێرگر؛ خۆراکێ لە گۆشتی قیمە، پیوازی جنراو، خوێ و بەهارات کە گەلاگەلای دەکەن و لە ڕۆندا سووری

دەکەنەوە ☰ همبرگر

**هەمبەرگێر** / hembergêr/: ☜ **هەمبەرگر**

**هەمبەلی** / hembelî/: ناوەڵناو. ١. ☜ **حەنبەلی ـ٢** ٢. *[مەجاز]* دڕدۆنگ لە پاک بوونەوە ☰ ١. ☜ **حەنبەلی ـ٢** ٢. وسواس در نظافت

**هەمبیزە** / hembîze/: ناوەڵناو. دوانە؛ ئاواڵدوانە؛ جمک؛ جفی ☰ دوقلو

**هەمبیەر** / hemb(i)yer/: ناوەڵناو. هاوبەش ☰ شریک

**هەمبێز** / hembêz/: ☜ **هامێز**

**هەمپا** / hempa/: ناوەڵناو. ١. دەوڵەمەندی گوند ٢. هاوسنف؛ هاوپیشە ٣. ☜ **هاوتا** ☰ ١. ثروتمند روستا ٢. هم‌پیشه ٣. ☜ **هاوتا**

**هەمپازی** / hempazî/: ناو. شانازی ‹ئەم هەمپازی ب تە دکن›. هەروەها: **هەمپازی کرن** ☰ افتخار

**هەمپشت** / hempişt/: ناوەڵناو. هاوپشت؛ لایەنگر؛ دژداری یەکتر ☰ هوادار همدیگر

**هەمپشک** / hempişk/: ناوەڵناو. هاوبەش ☰ شریک

**هەمپەیمان** / hempeyman/: ☜ **هاوپەیمان**

**هەمپیاڵە** / hemp(i)yałe/: ☜ **هاوپیاڵە**

**هەمت** / hem(i)t/: ناوەڵکار. ژدل؛ داخوازی؛ بەبێ زۆر لێ کردن ☰ قلباً

**هەمتا** / hemta/: ☜ **هاوتا**

**هەمتر** / hemtir/: ناوەڵکار. هەمدیس؛ زێدەتر ‹هەمتر تێکە› ☰ بازهم

**هەمتز** / hemtiz/: ناو. جاشەکەری یەکبڕ ☰ کُرّه‌خر یکساله

**هەمتەر** / hemter/: ☜ **هەمتی** [٢]

**هەمتەک** / hemtek/: ناوەڵناو. هاوتەک؛ هاوتا ‹هەر شوانێ کەی دەبێتە هەمقەرینی شاهی من؟/ سواری کەر نابێ ببێتە هەمتەکی سواری بوراق «مەحوی»› ☰ همتا

**هەمتی** [١] / hemtî/: ناو. هەمدی؛ گەنمە کوتاو ☰ گندم کوبیده

**هەمتی** [٢]: ناوەڵکار. هەمتەر؛ دیسان؛ دووبارە ☰ دوباره

**هەمچۆلا** / hemçola/: ناو. ١. جۆلانەی منال و نەخۆش ٢. جۆلانە؛ دێلەکانێ ☰ ١. ننوی کودک یا بیمار ٢. تاب

**هەمخەو** / hemxew/: ناو. هاونوێن؛ هاوجووت؛ هاوسەر ☰ همخوابه

**هەمد** / hemd/: ناو. ١. حەمد؛ پەسن ٢. ویست؛ بڕیار ‹بێ هەمدێ خۆ ئەز چووم› ٣. کێل؛ بەردی قەبر ☰ ١. حمد؛ ستایش ٢. اراده ٣. سنگ قبر

**هەمدا** / hemda/: ناوەڵناو. هاوتەمەن ☰ همسن

**هەمدامدا** / hemdamda/: ناوەڵکار. دەسبەجێ؛ هەرلەجێ؛ دەستەو لەجێ ☰ بی‌درنگ

**هەمدز** / hemdiz/: ناو. هەمزر؛ چەشنێ کەری چکۆلە ☰ نوعی الاغ ریزجُثه

**هەمدەرد** / hemderd/: ☜ **هاودەرد**

**هەمدەم** / hemdem/: ناو. هامدەم؛ هۆمدەم؛ هەڤدەم؛ ئاودەنگ ‹یا شێتی عەشقی دولبەرە ئاگای لە خۆی نییە/ یا وەحشییەکە هەمدەمی دەعبا و دڕندەیە «بێخود»› ☰ همدم

**هەمدی** / hemdî/: ☜ **هەمتی** [١]

**هەمدیس** / hemdîs/: ☜ **هەمدیسان**

**هەمدیسا** / hemdîsa/: ☜ **هەمدیسان**

**هەمدیسان** / hemdîsan/: ناوەڵکار. هەمدیس؛ هەمدیسا؛ هەمدیسانەوە؛ هەمیس؛ هەمیسا؛ هەمیسان؛ هەمیسانەوە؛ دیسانەوە ‹زانام هەمدیسان دڵ کۆسی نۆشەن/ گەردەلوولشەن ئارەزووی تۆشەن «مەولەوی»› ☰ بازدوباره

**هەمدیسانەوە** / hemdîsanewe/: ☜ **هەمدیسان**

**هەمراز** / hemraz/: ☜ **هامراز**

**هەمرۆ** / hemro/: ☜ **هەرمێ**

**هەمرۆکوچکینە** / hemrokuçkîne/: ناو.

هەرمێ‌کێویله؛ هەمرۆکێفیله؛ کرۆسک؛ شەقۆق؛ بەر و داری هەرمێ کێویلە کە بەرەکەی چکۆلەترە 🇮🇷 گلابی وحشی

**هەمرۆکێفیله** / hemrokêfîle/: ناو. کرۆسک؛ هەمرۆکوچکینە؛ هەرمێ‌کێویله 🇮🇷 گلابی وحشی

**هەمروو** / hemrû/: ☜ هەرمێ

**هەمڕا** / hemřa/: ئاوەڵناو. ١. پێکەوە ٢. ☜ هاوڕێ 🇮🇷 ١. باهم ٢. ☜ هاوڕێ

**هەمڕاز** / hemřaz/: ☜ هاوڕاز

**هەمڕایی** / hemřayî/: ☜ هاوڕێیی

**هەمڕەنگ** / hemřeng/: ☜ هاوڕەنگ

**هەمڕەنگی** / hemřengî/: ☜ هاوڕەنگی

**هەمڕیش** / hemřîş/: ☜ ئاوەڵزاوا

**هەمزار** / hemzar/: ☜ هەماواز

**هەمزاله** / hemzale/: ناو. هەرزاڵ؛ چارداغی ناو باغ 🇮🇷 خانەی چوبی باغ

**هەمزر** / hemzir/: ☜ هەمدز

**هەمزک** / hemzik/: ناو. چێشتێکە لە بۆتان باوە 🇮🇷 از غذاها

**هەمزمان** / hemz(i)man/: ☜ هاوزمان

**هەمزوان** / hemz(i)wan/: ☜ هاوزمان

**هەمزە** / hemze/: ناو. ناوی هەوەڵ پیتی ئەلفوبێی زمانی کوردی 🇮🇷 همزه؛ نخستین حرف الفبای زبان کُردی

**هەمزەبەگی** / hemzebegî/: ناو. جۆرێ مازوو 🇮🇷 نوعی مازوج

**هەمزەل** / hemzel/: ناو. جۆرێ کایەی منالانە 🇮🇷 از بازی‌های کودکان

**هەمس** / hemis/: ئاوەڵناو. ڕەش و سوور (مەڕ و بزن) 🇮🇷 سیاه و قرمز( بُز و گوسفند)

**هەمسا** / hemsa/: ☜ هاوسێ

**هەمساڵ** / hemsał/: ☜ هاوساڵ

**هەمسەر** / hemser/: ☜ هاوسەر[1]

**هەمسین** / hemsîn/: ناو. جۆرێ ڕەسەنی بزن 🇮🇷 نژادی از بُز

**هەمشاری** / hemşarî/: ☜ هاوشاری

**هەمشیر** / hemşîr/: ☜ هاوشیر

**هەمشێر** / hemşêr/: ناو. ناڤدێر؛ ناڤدایی؛ بەربژار 🇮🇷 نامزد؛ کاندیدا

**هەمکاری** / hemkarî/: ☜ هاوکاری

**هەمکوڕ** / hemkuř/: ناو/ ئاوەڵناو. هاوڕێ 🇮🇷 دوست

**هەمکە** / hemke/: ئاوەڵکار. هەموو؛ هەمگە؛ زۆر؛ گەلێک ‹ئەم هەمکە پارە لە کوێ بێرم؟› 🇮🇷 بسیار

**هەمگە** / hemge/: ☜ هەمکە

**هەمگەل**[1] / hemgel/: ناو. هەرچی خودا دروستی کردووە 🇮🇷 آفریده

**هەمگەل**[2]: ئاوەڵناو. هاونەژاد 🇮🇷 هم‌نژاد

**هەمگەلی** / hemgelî/: ناو. تێکڕای خاوەن هەبوونان 🇮🇷 همەی موجودات

**هەمگین** / hemgîn/: ☜ هەنگوین

**هەمل** / heml/: ئاوەڵناو. ١. زگپڕ؛ ئاوس ٢. بارهەڵگر؛ حەماڵ 🇮🇷 ١. باردار؛ حامله ٢. باربر

**هەملک** / hemlik/: ئاوەڵناو. ١. دابەستە؛ پەروار ٢. قەڵەو؛ تێرگۆشت 🇮🇷 ١. پروار ٢. فربه

**هەمڵ** / hemł/: ناو. گریمانە 🇮🇷 فرضیه

**هەمما** / hemma/: ئاوەڵکار. ١. هەرکە؛ تاکوو ٢. دەسبەجێ؛ هەر لەجێ ٣. هەر؛ تەنیا ‹هەمما تۆ ساغ بە ئەو نە تشتە› 🇮🇷 ١. همین‌که ٢. بلافاصله ٣. فقط

**هەمن** / hemn/: ناو. قەمتەرە؛ پەتێکە ڕەشماڵی لە چوارلاوە پێ قایم دەکەن ‹سەری هەمنەکان بەو هەیانەوە ببەستە!› 🇮🇷 طناب چادر و خیمه

**هەمن**[1] / hemin/: ناو. کار و ڕەوتی لێکۆڵینەوە؛ تۆژینەوە 🇮🇷 پژوهش

**هەمن**[2]: جێناو. هەموو؛ گشت 🇮🇷 همه

**هەمنک** / hemnik/: ناو. گوریسی پێوەندی یەکسم

≡ رسن پایبند ستور

**هەموار** / hemwar/: ئاوەڵناو. ١. لەبار؛ شیاو؛ گونجاو ‹ئەم کارە دەگەڵ ڕێوڕەسمی ئێمە هەموارە› ٢. هێواش؛ لەسەرخۆ ‹بە ڕەفت و هەموار، بە ڕێزەڕێزان/ مەشان بەو کۆوە، بە مورادوازان «سەیدی»› ≡ ١. مُناسب ٢. آهسته

**هەموان** / hemwan/: جێناو. گشت؛ گش؛ هەموو؛ تێکڕا ‹دیارە خودا ڕۆژی سەلا بە کاری هەموان ڕادەگا «هەژار، *قورئان*»› ≡ همگان

**هەموانی** / hemwanî/: ئاوەڵناو. گشتی؛ گشتلایی؛ گلایی؛ گشتگیر؛ هەمەلایەنە؛ تێکڕایی ‹جەحەندەمیش جێژوانێکی هەموانییە «هەژار، *قورئان*»› ≡ همگانی

**هەموو**[1] / hemû/: ☜ هەنبانە

**هەموو**[2]: ئاوەڵناو. هەمە؛ هەمی؛ حەموو؛ هەمێ؛ حەمێ؛ حەپوو؛ هەمن؛ همار؛ هەمار؛ هەمان؛ چی؛ گ؛ گشت؛ گش؛ گشک؛ گرد؛ کۆگرد؛ گژ؛ گێ؛ تەڤ ‹مەرگە دێ و دوا بە هەموو شت دینێ/ هەموو ئاواتێ لە دڵ دەستێنێ «سوارە»› ≡ همه

**هەموو**[3]: ئاوەڵکار. هەمە؛ هەمی؛ تێکڕا؛ بە تێکڕایی؛ بەگشتی؛ گش؛ گشت؛ هەموان؛ گرد؛ خڕ؛ خرمچوون؛ مچوون؛ یەکبەیەک؛ تاکبەتاک؛ تەکبەتەک؛ تەمام؛ تەواو؛ پاک؛ سەرپاک؛ بە تەواوی؛ بە هەموان؛ لەبن؛ بە هەموانەوە؛ بەیەکەوە؛ سەرلەبەر؛ سەرانسەر ‹ڕەفیقانم هەموو ڕۆیین لە دێدا/ بە تەنها هەر ئەمن ماوم لە جێدا «ناری»› ≡ همه

**هەموو**[4]: جێناو. هەمە؛ هەمی؛ گشت؛ گش؛ گرد؛ هەمن؛ گژ ‹بفەرموو بێخودی شیرین‌کەلام ئەڵێ بە هەمووتان/ ئەگەرچی خوسرەوی شیعرم بەلام غولامی ئەوانم «بێخود»› ≡ همه

**هەمووتی** / hemûtî/: ئاوەڵکار. تێکڕایی؛ بە گەل ≡ دستەجمعی؛ جملگی

**هەمووکی** / hemûkî/: ئاوەڵکار. بێ کەم و کووڕی؛ تەمامی ≡ به تمامی

**هەمە**[1] / heme/: ☜ هەموو[2و3و4]

**هەمە**[2]: ئامراز. بەلام؛ بلان ≡ اما

**هەمەت**[1] / hemet/: ناو. ١. کار و ڕەوتی لێ ڕوانین؛ سەیر کردن ‹کوڕینە وەرنە هەمەتێ!› ٢. بڕوایی ‹تە هەمەتا خۆ دایە سەررکی› ٣. تەوژم و زۆر هێنان لە پری ‹هەمەتا ئاڤی ل سەرە› ٤. یاریدە؛ یارمەتی ٥. پارێز؛ ڕەوتی پاراستن ≡ ١. مُلاحظه ٢. باور ٣. فشار از تراکُم ٤. کُمک ٥. نگهداری

**هەمەت**[2]: ئاوەڵناو. سەیر و تواشایی ‹تشتەکێ هەمەتە!› ≡ تماشایی

**هەمەجۆر** / hemecor/: ئاوەڵناو. لە هەموو تاقم و جنسێ ‹هۆنراوەی هەمەجۆر؛ خەڵکی هەمەجۆر› ≡ همەنوع

**هەمەڕەنگ** / hemeřeng/: ئاوەڵکار. هەمەڕەنگە؛ گجۆرە؛ هەموو جۆر ≡ همه نوع

**هەمەڕەنگە** / hemeřenge/: ☜ هەمەڕەنگ

**هەمەک** / hemek/: ☜ ئەمەگ

**هەمەکارە** / hemekare/: ئاوەڵناو. ١. دەسچووو؛ کارلێهاتوو ٢. سەردەرچوو لە زۆر کاران ٣. لەبار بۆ ئەنجامی هەر کارێ ≡ ١تا٣. همەکارە

**هەمەکی** / hemekî/: ئاوەڵناو. گشتی؛ هەموانی؛ هەمەلایەنە ≡ همگانی

**هەمەگ** / hemeg/: ☜ ئەمەگ

**هەمەلایەنە** / hemelayene/: ئاوەڵناو. هەموانی؛ گشتی؛ تێکڕایی ≡ همگانی

**هەمەندوش** / hemenduş/: ناو. حەوجۆش ≡ مفرغ

**هەمەوەختی** / hemewextî/: ئاوەڵناو. شەووڕۆژی؛ دایمی ≡ شبانەروزی

**هەمهونە** / hemhûne/: ئاوەڵناو. ئاوماڵ؛ هاوماڵ ≡ همخانە

**هەمهەمە** / hemheme/: ناو. هەراو هوریا؛ چەقە و

گوڕە ‹لەم وەزعە گەر ئەی دوژمنی کورد ئێوە ئەپرسن/ ئەم هەمهەمەیە میللەتە هەڵساوە، بترسن!
«بێخود»› ☰ همهمە

**هەمی / hemî/:** ☜ **هەموو**[٢و٣و٤]

**هەمیان / hemyan/:** ناو. ١. پشتێندی لە مێشن بۆ پارە تێدا هەڵگرتن ٢. ☜ **هەنبانە** ☰ ١. کمربند چرمی برای حمل پول ٢. ☜ **هەنبانە**

**هەمیانی / hemyanî/:** ناوەڵناو. کۆداگر؛ کۆگرەوە ☰ جامع

**هەمیر / hemîr/:** ☜ **هەویر**

**هەمیس / hemîs/:** ☜ **هەمدیسان**

**هەمیسا / hemîsa/:** ☜ **هەمدیسان**

**هەمیسان / hemîsan/:** ☜ **هەمدیسان**

**هەمیسانەوە / hemîsanewe/:** ☜ **هەمدیسان**

**هەمیشە / hemîşe/:** ناوەڵکار. دایم و دەرهەم؛ بێبڕانەوە ‹مەجنوونی گەردی ناقەیی لەیلایە، وەرنە بۆچ/ وەک چاوی من هەمیشە لە شوێن کارەوانە دڵ؟ «بێخود»› ☰ همیشە

**هەمیشەبەهار / hemîşebehar/:** ناو. بەیبوونە کێویلە؛ هەمیشەبەهارە؛ هەمیشەوەهار؛ هەمیشەجوان؛ گیایەکی جوانی یەکساڵەیە بە گەڵای کوڵکن، دوو جۆر گوڵی زمانەیی و لوولەیی زەرد و بەری وەک فندقەوە کە لە چوارووەرزی ساڵدا گوڵ دەکا ‹هەمیشەبەهار لە کەناری چەم/ ببووە لاگیرە و گوڵی سەرپەرچەم «پیرەمێرد»› ☰ گُل همیشە بهار

**هەمیشەبەهارە / hemîşebehare/:** ☜ **هەمیشەبەهار**

**هەمیشەجوان / hemîşec(i)wan/:** ☜ **هەمیشەبەهار**

**هەمیشەگوڵ / hemîşeguł/:** ناو. گوڵەکەتان؛ هەمیشەجوان ☰ گُل کتانی

**هەمیشەوەوی / hemîşewewî/:** ناوەڵناو. تایبەتمەندی ژنێ کە بە مێردێکەوە ناوەستێ و زۆر مێردان دەکا ☰ ویژگی زنی کە بسیار شوهر کند

**هەمیشەوەهار / hemîşewehar/:** ☜ **هەمیشەبەهار**

**هەمیشەیی / hemîşeyî/:** ناوەڵناو. بەردەوام؛ بێبڕانەوە ☰ همیشگی

**هەمیلا / hemîla/:** ناوەڵناو. ئاوس؛ سکپڕ ☰ باردار؛ حاملە

**هەمین[١] / hemîn/:** ناوەڵناو. ١. سست و شلەپەتە ٢. خۆ بە کارنەدەر؛ پاش گوێخەری کار ☰ ١. سُست و تنبل ٢. از زیر کار دررو

**هەمین[٢]:** ناوەڵکار. ١. ☜ **هێشتا** ٢. تا ئێستە ☰ ١. ☜ **هێشتا** ٢. هنوز

**هەمین[٣]:** جێناو. هەموو؛ هەمی ☰ **همگان**

**هەمینە / hemîne/:** جێناو. هەموو تێکڕا؛ **گشت لە گشت** ☰ همگان

**هەمێ / hemê/:** ناوەڵناو. هەموو؛ هەمە ☰ همە

**هەمێز / hemêz/:** ☜ **هامێز**

**هەن[١] / hen/:** ناو. بوود؛ دارایی ☰ دارایی

**هەن[٢]:** ناوەڵکار. هەند؛ هێند؛ ئەوەندە ☰ آن‌قدر

**هەنا[١] / hena/:** ناو. ١. هانا؛ هەتەر؛ قەوەتی دیتن ٢. هانا؛ ڕەوتی گەیشتن ‹تا دەست هەنا ئەکا باڵابەرزە› ٣. هەدا؛ چۆنیەتی سرەوتن ‹لەبەر ئێشی لەشم قەت هەنا نادەم› ٤. هانا؛ پەنا ٥. فریا ‹دە هەنام هات› ☰ ١. قدرت دید ٢. دسترسی ٣. آسودگی ۴. پناه ۵. فریادرسی

**هەنا[٢]:** ناوەڵکار. بەم جۆرە؛ ئاوەها ☰ **این‌طور**

**هەنار / henar/:** ناو. ئەنار؛ نار؛ هنار: ١. هنارێر؛ هناریز؛ هەناریز؛ دار یان دارچکێکی دڕکاوییە چێویکی پتەوی هەیە و گوڵێکی سوور و گچکە (گلیار) دەکا ٢. میوەی ئەو دارە کە پاییز پێدەگا و قاپێلکی خڕە و زۆر دەنکی ترش، شیرین یان مێخۆشی تێدایە ☰ ١و٢. انار

**هەناردن / henardin/**: چاوگ. هنارتن؛ ناردن؛ ڕەوانە کردن 🇮🇷 فرستادن

**هەناردنەوە / henard(i)newe/**: ئاوەڵناو. ناردنەوە؛ گەڕاندنەوە 🇮🇷 پس فرستادن

**هەناردو / henardû/**: ئاوەڵناو. هنارتی؛ هەناردی؛ هەناری؛ ڕەوانەکراو 🇮🇷 فرستاده

**هەنارده / henarde/**: ناو. هنارتی؛ هەناردی؛ نارده؛ کالا یا ن ڕاژەیێ کە لە ناوچە یان وڵاتێکەوە بۆ فرۆش دەنێردرێتە ناوچە یان وڵاتێکی دیکە. بەرانبەر: **هاوردە** 🇮🇷 صادرات

**هەناردی / henardî/**: ☜ **هەناردو**

**هەنارستان / henar(i)stan/**: چاوگ. ئەنارلوو؛ باخی هەنار 🇮🇷 انارستان

**هەنارۆک / henarok/**: ناو. نارنجەک 🇮🇷 نارنجک

**هەناری / henarî/**: ئاوەڵناو. ١. ☜ **هەناردو** ٢. بەڕەنگی دەنکێ هەنار 🇮🇷 ١. ☜ **هەناردو** ٢. بە رنگ دانەی انار

**هەناریاگ / henaryag/**: ئاوەڵناو. ناردراو؛ نێردراو؛ ڕەوانەکراو 🇮🇷 فرستاده شده

**هەناریان / henaryan/**: چاوگ. ناردران؛ نێردران 🇮🇷 فرستاده شدن

**هەنارێز / henarêz/**: ☜ **هەنار ـ١**

**هەنارەس / henařes/**: ئاوەڵناو. فریارەس 🇮🇷 فریادرس

**هەناس / henas/**: ☜ **هەناسە**

**هەناسکە / henaske/**: ☜ **هەناسە**

**هەناسکەبڕکێ/ henaskebiřkê/**: ☜ **هەناسەبڕکێ**

**هەناسکەبڕی / henaskeb(i)řî/**: ☜ **هەناسەبڕکێ**

**هەناسکەبڕێ / henaskeb(i)řê/**: ☜ **هەناسەبڕکێ**

**هەناسە / henase/**: ناو. هناس؛ هناسە؛ هەناسکە؛ هناس؛ هەناس؛ نەفەس؛ نەفەسە؛ ئنە؛ نەز؛ نز؛ فز؛ بین؛ بهن؛ بینگ؛ بهین؛ پشوو؛ پشی؛ پەتۆ؛ برش؛ پرش؛ هەلک؛ هەرەس؛ هەرەنگ: ١. هلم؛ هڵم؛ بایێ کە لە ناو دەم و سیپەلاکدا دێ و دەچێ ‹هەناسەی لێوی لالەی کێیە وا ڕەنگی بەهاری ڕشت/ کە ئەم دنیایە یەکسەر باغە، ئەم سەحرایە ڕەنگینە؟! «بێخود»› ٢. ڕەوت یان چۆنیەتی هەناسە دان ‹هەناسە بدە!› ٣. هەوایەک کە لە دەمەوە دێت ‹هەناسەم زوڵفەکەی لا دا و مەیلێکی نەکرد چاوی/ نەسیم ئەنگووت و شەو ڕابرد و نەرگس هەر لە خەودایە «نالی»› ٤. *[مەجاز]* ژین؛ ژیان ‹هەناسەی کەسێ بڕین› ٥. *[مەجاز]* هێز و بڕست ‹هێندە هەلاتین لە هەناسە کەوتین› 🇮🇷 ١تا٥. نفس

▣ **هەناسەی سارد:** *[مەجاز]* قسەی دڵساردکەرەوە؛ قسەی ناهمێ‌کەر ‹هەناسەی سارد لە دڵێکی گەرم و بەکوڵ هاتۆتە دەر، ژەهراوی تالاوی ژیانی چارەڕەشێک، کەفی گەمە و تیز بە دنیایە کردنی هاتۆتە سەر «هەژار، چەپکەگوڵ»› 🇮🇷 دم سرد

**هەناسەی گەرم:** *[مەجاز]* ١. قسەی شادیهێن و هیوابەخش ‹لە پاداشتی قسەی ساردا، هەمە ئاه و هەناسەی گەرم/ کەسێ شێتانە بەردم تێ‌گرێ، من بەرقی تێ‌دەگرم «مەحوی»› ٢. قسەی بەتین و گوڕ 🇮🇷 ١و٢. نفس گرم

▣ **هەناسە دان:** ١. هەناسە دەرهاتن؛ هەناسە کێشان؛ نەفەس کێشان ٢. زیندوو بوونەوە (زەوی) ‹هەوا خۆش بووە، زەوی هەناسەی داوە› 🇮🇷 ١. نفس کشیدن ٢. زنده شدن (زمین)

**هەناسە دانەوە:** نەفەس گەڕانەوە 🇮🇷 بازگشتن نفس

**هەناسە دەرهاتن:** ☜ **هەناسە دان ـ١**

**هەناسە کێشان:** ☜ **هەناسە دان ـ١**

**هەناسە کەوتنە ژمارە:** کەوتنە حاڵی گیانەلا ‹ئەوا هەناسەم کەوتە ژمارە/ هێندەم نەماوە وا ئەمرم دیارە «پیرەمێرد»› 🇮🇷 نفس به شماره افتادن

**هەناسە نەدان:** *[کینایە]* متەق دەرنەهاتن؛ هیچ

نەگوتن لام تا کام نگفتن

**هەناسە هەڵکێشان**: نەفەسی خـەمێ دان؛ ئـاخ و ئاه گوتن آه حسرت کشیدن

**هەناسەبڕاو** / henaseb(i)řaw/: ئاوەڵناو. خنکاو خفەشدە

**هەناسەبڕکە** / henasebiřke/: ☜ **هەناسەبڕکێ**

**هەناسەبڕکێ** / henasebiřkê/: ناو. هەناسکەبڕکێ؛ هەناسـکەبڕی؛ هەناسـکەبڕی؛ هەناسـەبڕکە؛ هەنسـکەبڕکێ؛ هەناسـەکوڕی؛ هەنسـکەبڕێ؛ تەنگەنەفەسی نفس‌تنگی

**هەناسەتەنگی** / henasetengî/: نـاو. ئـانژین آنژین

**هەناسەڕەش** / henaseřeş/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* بەغیل؛ بەرچاوتەنگ حسود

**هەناسەسارد** / henasesard/: ئاوەڵـناو. *[مـەجاز]* هەناسەسەرد: ١. ڕەنجبێوەر؛ بە ئاکام نەگەیشتوو ٢. خاکەسەر و ناهمێ ١. نامُراد ٢. بینوا

**هەناسەساردی** / henasesardî/: نـاو. *[کینایـە]* بێڤەری؛ ناهومێدی نومیدی

**هەناسەسوار** / henases(i)war/: ئاوەڵناو. پشووسوار نفس‌تنگ

**هەناسەسواری** / henases(i)warî/: نـاو. پشووسواری؛ نەخۆشی تەنگەنەفەسی کـە زیـاتر پیر تووشی دەبن نفس‌تنگی

**هەناسەسەرد** / henaseserd/: ☜ **هەناسەسارد**

**هەناسەکوڕی** / henasekuřî/: ☜ **هەناسەبڕکێ**

**هەناسەوهەناو** / henase w henaw/: ناو. *[کینایە]* بارودۆخی دەروونی حالات درونی

**هەناڤ** / henav/: نـاو. دەروون؛ هـەرچی لـە نـاو زگدایە احشاء

**هەناڤرەش** / henavreş/: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* دڵ‌پـیس بدنهاد

**هەناکنای** / henaknay/: چـاوگ. هەنکەهـەنک کردن هێن‌وهێن کردن

**هەناکیای** / henakyay/: چـاوگ. کەوتنـە هەنکەهەنک بە هێن‌وهێن افتادن

**هەناو** / henaw/: ناو. هناو؛ هەناڤ: ١. چەشـگە؛ هەنـدرخان؛ نـاوزگ؛ ئەنـدامانی نـاو زگ (وەک جەرگ، گورچیلە، سپڵ و ...) ‹پزیشکی پسـپۆڕی نەخۆشییەکانی هەناو› ٢. ناو؛ جەرگ و ناو ‹گریە و گـرەی تـەنوورە بلێسـەی هەناوەکـەم/ سـیروان و تانجەڕۆیە خورەی ئاوی چاوەکەم «ئەحمەد موختـار بەگ»› ٣. ورە؛ هێز؛ قەوەت ‹تاو هـەناوی نییـە، وا مـات و پەشـێو/ لەشـی زامـاری ئەکێشـێتە نشـێو «سوارە»› ٤. کـاری سـواخ دان. هـەروەها **هـەناو کـردن** ١. احشـاء ٢. درون؛ دل ٣. نیـرو ۴. عمـل گل‌اندود کردن

**هەناوبینی** / henawbînî/: نـاو. ئاندوسـکۆپی آندوسکپی

**هەنبار** / henbar/: ☜ **هەمار**

**هەنبانۆکە** / henbanoke/: ☜ **هەوانچە**

**هەنبانە** / henbane/: نـاو. همبـان؛ همبانـە؛ هومبان؛ هەبان؛ هەبانە؛ هەڤان؛ هەڤـانە؛ هـەمان؛ هەمانـە؛ هـەمبان؛ هەمبانـە؛ هـەموو؛ هـەمیان؛ هەوان؛ هەوانە؛ پێستی گووراوی بزن و مـەڕ کـە دەیکەنە دەفری شتومەک انبان

**هەنبانەبۆرینە** / henbaneborîne/: نـاو. *[بـاوەڕی کـۆن]* هەمبانـەبۆرین؛ هەمبانەبۆرینـە؛ هەمبانەگۆرینە؛ هەنبانەگۆرینە؛ هەنبانەیەکـە لـە چیرۆکـی کـەونارادا دەڵـێن دەسـتیان تـێ ڕۆ کردووە و هـەرچی ئارەزوویـان کـردووە، هاتۆتـە دەستیانەوە انبان جادویی در افسانەها کـە گویـا محتوای همە چیز بودە

**هەنبانەگۆرینە** / henbanegorîne/: ☜ **هەنبانەبۆرینە**

**هەنتن** / hentin/: چاوگ. کوتان؛ دەرزی وەشاندن

🇮🇷 تزریق کردن

**هەنتەش / hentes̡**: ناو. هاند؛ حاند؛ حەنا ‹د هەنتەشا ڤێ دە ئەز نەشێم بێژم› 🇮🇷 حضور

**هەنج / henc**: ناو. ١. جۆرێ دورمان ٢. تیرە؛ کورتە هێلێ لە نووسیندا بۆ نێوان دانان یان نیشاندانی جۆرێ پێوەندی « ـ » ٣. دووگە وشتر 🇮🇷 ١. نوعی دوخت ٢. تیرە؛ خط تیرە ٣. کوهان شتر

⊡ **هەنج کرن**: پەیوەنددان؛ گەیاندنە یەک؛ لێک گیر دان 🇮🇷 مُتصل کردن

**هەنجار / hencar**: ئاوەڵناو. پێودان؛ نەریتێکی گونجاو لە کۆمەڵگادا؛ بە تایبەتمەندی یەک گرتنەوە لەگەڵ کۆمەڵگادا ‹هەڵس‌وکەوتی هەنجار لە کۆمەڵگا› 🇮🇷 هَنجار

**هەنجاڕ / hencař**: ناو. ئاموور؛ ئەسپابی جووت 🇮🇷 خیش

**هەنجاندن / hencandin**: ☜ هەنجنین

**ـ هەنجن / hencin-**: ☜ ـ نەنجن

**هەنجناو / henc(i)naw**: ئاوەڵناو. جنیاگ؛ هنجنی؛ وردکراو 🇮🇷 انجیده

**هەنجنای / henc(i)nay**: چاوگ. هەنجنین 🇮🇷 انجیدن

**هەنجنران / hencinran**: چاوگ. تێنەپەڕ. نادیار. //هەنجنرای؛ دەهەنجنرێی؛ بهەنجنرێ// شی کرانەوە؛ ڕیشاڵ ڕیشاڵ کرانەوە 🇮🇷 ریش ریش شدن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: هەنجنراو/ چاوگی نەرێنی: نەهەنجران

**هەنجنراو / hencinraw**: ئاوەڵناو. شی‌کراو؛ ڕیشاڵ ڕیشاڵ‌کراوە 🇮🇷 ریش ریش شده

**هەنجن‌هەنجن / hencinhencin**: ☜ نەنجن‌نەنجن

**هەنجنین / henc(i)nîn**: چاوگ. تێپەڕ. //هەنجنیت؛ دەهەنجنی؛ بهەنجنە// هەنجاندن؛ ئەنجنین؛ ورد کردن بە تیغ و ... ‹گۆشت و سیرمان هەنجنی و تێکمان هەڵپشاوت، بە لکە داریکماندا کرد و بەیانی بە ئاگری پۆلوانمان برژاند «هەژار، چێشتی مجێور»› 🇮🇷 قیمە کردن

■ ئاوەڵناوی بەرکاری: هەنجنیو/ چاوگی نەرێنی: نەهەنجنین

**هەنجنیو / henc(i)nîw**: ئاوەڵناو. جنراو؛ جنیاگ؛ پەل ـ پەل کراو 🇮🇷 قیمە شدە

**هەنجوێن / henc(i)wên**: ☜ هەنگوین

**هەنجووچک / hencûcik**: ☜ هەجوچك

**هەنجوورە / hencûre**: ناو. هەنگوورە؛ هنگوور؛ ئێوارە درەنگێک 🇮🇷 تنگ غروب

**هەنجە / hence**: ناو. ١. شوێنی لێک هەڵپچڕان ٢. کاری لێک ترازاندن 🇮🇷 ١. محل شکافتگی و ازهم باز شدن ٢. عمل از هم جدا کردن

**هەنجەت / hencet**: ناو. هنجەت؛ هینجەت؛ هێجەت؛ هێنجەت؛ پەڵپ؛ بیانوو؛ بەهانە 🇮🇷 بهانە

**هەنجەل / hencel**: ☜ ئەجەل

**هەنجەڵ / henceł**: ناو. عەجەل 🇮🇷 اجل

**هەنجیر / hencîr**: ناو. ئەنجیر؛ هژیر؛ هەژیر؛ هێژیر؛ هەژیرە؛ هنجیر؛ تەوسکە: ١. دار یان دارچکێکی توێکڵ خۆڵەمێشی، گەڵاپان و زروی تووکنە ٢. میوەی ئەو دارە کە شیرین و گۆشتنی ئاودارە و زۆرێک دەنکەوردیلەی تێدایە و دەخورێ (چەند جۆری هەیە وەک؛ درهی؛ هەرکافانی؛ هێکناتی؛ ڕژیک؛ شنگالی؛ تەفارە؛ زەرک و ...) 🇮🇷 ١و٢. انجیر

**هەنجیراو / hencîraw**: ناو. ئاوهەنجیر؛ هەنجیری دە ئاوکراو و خۆشەکراو بۆ خواردن 🇮🇷 آب انجیر

**هەنجیرباوا / hencîrbawa**: ناو. مۆز؛ مەوز: ١. دار یان دەوەنی گەرمەسێری بە میوەی گۆشتنی خۆراکییەوە ٢. میوەی ئەو دارە کە درێژ و باریک و گۆشتنە، تژی لە ماکی قەندی 🇮🇷 ١و٢. موز

**هەنجیرخۆرە / hencîrxore**: ناو. هەنجیرەوەرە؛ مەلێکە نزیک ٢٥ سانتی‌میتر دەبێ، نێری زەردی

بال و کلک ڕەشە، مێی کەسکی مەیلەو زەردە، لە ناو لکوپۆی داران خۆ نەدیو دەکا، زۆرتر لە سەر چڵووکی داران دەنیشێ، هێلانەکەی بە دوو لکی دارەوە هەڵدەواسێ، هاوینان زۆرە ≡ انجیرخوار؛ پری‌شاهرخ

**هەنجیرەکێوی** /hencîrekêwî/: ناو. تەفسک؛ تەفزک؛ تەفاریک؛ هەنجیرەکێویلە ≡ انجیر کوهی

**هەنجیرەکێویلە** /hencîrekêwîle/: ☜ هەنجیرەکێوی

**هەنجیرەوەرە** /hencîrewere/: ☜ هەنجیرخۆرە

**هەند[1]** /hend/: ناو. ١. ئەندازە؛ ڕادە؛ شۆ ٢. هێند؛ بڕ؛ ڕێژە ≡ ١. اندازە ٢. مقدار

**هەند[2]**: ئاوەڵکار. هەندۆ: ١. بڕێ؛ بەشێ ٢. ئەوەند؛ ئەوەندە؛ ئەونە ≡ ١. بعض ٢. آنقدر

**هەنداڤ[1]** /hendav/: ناو. هەنداو؛ لای سەروو ‹ل هەنداڤێ دانیشە!› ≡ بالا

**هەنداڤ[2]**: ئاوەڵناو. هەنداو: ١. سەروو؛ ژوورگ ‹گوندێ هەنداڤێ› ٢. بەرانبەر؛ ڕووبەڕوو ‹مالێ وی لە هەنداڤی دەریایێیە› ≡ ١. بالا ٢. مُقابل

**هەندام** /hendam/: ☜ ئەندام

**هەنداو** /hendaw/: ☜ هەنداڤ

**هەندای** /henday/: ئاوەڵکار. هەند؛ ئەوەند ≡ آنقدر

**هەندایین** /hendayîn/: ئاوەڵکار. ئەوەندە؛ ئەو ئەندازە ≡ اینقدر

**هەندباڵ** /hendbał/: ناو. یارییەکی وەک فووتبال بە ٧ یاریزانەوە کە تۆپەکە بە دەست دەهاوێن ≡ هندبال

**هەندر** /hendir/: ناو. هەدا؛ ئۆقرە ≡ آرامش

**هەندران** /hend(i)ran/: چاوگ. هەندریان؛ هەندرین؛ ئۆقرە گرتن ≡ آرامش یافتن

**هەندرخان** /hendirxan/: ناو. هەناو؛ ناڤ؛ ناوزگ ≡ احشاء

**هەندروو** /hend(i)rû/: ناو. ١. ژووری ماڵەوە؛ ئەندەروونی ٢. ناوی هەر شتێ ≡ ١. اندرونی خانه ٢. اندرون

**هەندرهۆ** /hendirho/: ناو. حندرحۆ؛ هەڵلادۆشە ≡ آلاکُلنگ

**هەندریان** /hendiryan/: ☜ هەندران

**هەندریای** /hendiryay/: ئاوەڵناو. ئۆقرەگرتوو ≡ آرام گرفته

**هەندرین** /hend(i)rîn/: ☜ هەندران

**هەندرێشن** /hend(i)rêşin/: ☜ هەندرێشە

**هەندرێشە** /hend(i)rêşe/: ناو. هنترش؛ هەندرێشن؛ پیچکە؛ پێچووکە؛ دالەهۆ؛ گیایەکی تام تیژی گەلا بڵندە بۆ دەرمان دەشێ ≡ پیازچەای بهاری

**هەندومەند** /hend û mand/: ناو. /کینایە/ شەرمی ژن ‹شەڵوارەکەی پێ کەندم/ بردی لە هەندومەندم! «گەپوگاڵتە»› ≡ شرمگاه زن

**هەندۆ** /hendo/: ☜ هەند[2]

**هەندوو** /hendû/: ناو. کەڵتە؛ کاری چا کردنەوەی هەر شتێ ≡ تعمیر

**هەندە** /hende/: ئاوەڵکار. ئەوەندە ≡ اینقدر

**هەندەر** /hender/: ناو. ١. لاوە؛ دەرەوەی وڵات ٢. ئاست؛ حاند؛ حەنا ٣. هەنتەش؛ حوزوور ≡ ١. خارج ٢. مُقابل ٣. حضور

**هەندەران** /henderan/: ناو. ١. هەنەران؛ وڵاتانی دەرەوە ‹کوا مەتاعی کوردەواریمان دەچوو بۆ هەندەران/ گەر بە سەربەرزی نەژیبا ئەوکچە مازووچنە؟ «هێمن»› ٢. دەرەتان ‹لە تاوانا هەندەرانی نەبوو› ≡ ١. خارج ٢. مَفر

**هەندەسە** /hendese/: ناو. ١. لقێ لە زانستی بیرکاری کە بە ئەندازەگیری، تایبەتمەندی و پێوەندییەکانی خاڵ، هێڵ، ڕووبەر، گۆشە و بارستاییەوە دەپەرژێ ٢. کتێبێ کە لەمەڕ

**هەنگوان**[1] / heng(i)wan/: ☜ **ئەنگوان**

**هەنگوان**[2]: ناو. هەڵز؛ گیایەکە ⵉ گیاه انجدان

**هەنگواو** / heng(i)waw/: ناوەڵناو. ئەنگاوتە؛ ئەنگێوراو ⵉ مورد اصابت واقع شده

**هەنگوتکژمێر** / hengutikjmêr/: ناوەڵناو. /کنایە/ خونک؛ چکووس ⵉ خسیس

**هەنگوچک** / henguçik/: ☜ **ئەنگوچك**

**هەنگوژە** / henguje/: ناو. ١. جەوی؛ جیوەی دار و گیا ٢. شیرەی گیای هەڵز ⵉ ١. انگم ٢. شیرەی گیاه انجدان

**هەنگوسانە** / hengusane/: ناو. هەنگوستیر؛ ئەنگوستیلە ⵉ انگشتانە

**هەنگوست** / hengust/: ☜ **ئەنگوست**

**هەنگوستیر** / hengustîr/: ☜ **هەنگوسانە**

**هەنگوستیل** / hengustîl/: ☜ **ئەنگوستیلە ـ١**

**هەنگوستیلک** / hengustîlik/: ☜ **ئەنگوستیلە ـ١**

**هەنگوسیلک** / hengusîlik/: ناو. کۆلکانە؛ کلکەوانە؛ ئەنگوستیلە ⵉ انگشتری

**هەنگولیسک** / hengulîsk/: ☜ **ئەنگوستیلە ـ١**

**هەنگون** / hengun/: ☜ **هەنگوین**

**هەنگوین** / hengwîn/: ناو. هەنگف؛ هنگفین؛ هنگمێن؛ هنگووف؛ هەمگین؛ هەنگف؛ هەنگفین؛ هەنگمین؛ هەنگون؛ هەنگووین؛ هەنگەمین؛ هەنگین؛ هەنگوێن؛ هەنجوێن؛ هەنوین؛ هەنگوون؛ هنگوف؛ هەسەڵ؛ ئەسەڵ؛ کوتەفڕ؛ کاریت؛ بەرهەمی شیلە و شیرینی مێشەنگوین ⵉ عسل

**هەنگوێن** / hengwên/: ☜ **هەنگوین**

**هەنگۆچنە** / hengoç(i)ne/: ☜ **هەنگەچینە**

**هەنگۆر** / hengor/: ☜ **هەنگور**

**هەنگۆرانە** / hengorane/: ناو. عەسرۆژە؛ ژەمەخوێری؛ خواردنی سەرلە ئێوارە ⵉ عصرانە

**هەنگۆرە** / hengore/: ناو. هەنگفار؛ ئەنگۆرە ⵉ هنگام غروب

**هەنگۆری** / hengorî/: ناو. هەیبۆر؛ ئەنگۆرە ⵉ تنگ غروب

**هەنگۆڵ** / hengoł/: ناو. ١. ☜ **هەنگڵ** ٢. پاچە؛ پاوپلی ئاژەڵ ⵉ ١. ☜ **هەنگڵ** ٢. پاچەی حیوان

**هەنگو** / hengû/: ☜ **ئەنگۆ**

**هەنگور** / hengûr/: ناو. ئەنگوور؛ ئەنگیر؛ ئەنوویر؛ ئەنیور؛ ئەنوویر؛ هنگوور؛ هنگور؛ هەنگۆر؛ هنگەریر؛ هەنگووری؛ هەنگیر؛ هەنوویر؛ هەوور؛ ترێ؛ میوەی دارە مێو کە پتر لە ٣٠٠ جۆری هەیە ⵉ انگور

**هەنگورە** / hengûre/: ناو. ١. جۆرێ جاڵجاڵووکە ٢. مێشەنگوینی خراپ ٣. ☜ **هەنگەبۆڵە** ⵉ ١. نوعی عنکبوت ٢. زنبورعسل بداصل ٣. ☜ **هەنگەبۆڵە**

**هەنگووری** / hengûrî/: ☜ **هەنگور**

**هەنگوون** / hengûn/: ☜ **هەنگوین**

**هەنگووین** / hengûyn/: ☜ **هەنگوین**

**هەنگەبۆڵە** / hengebołe/: ناو. هەنگەڕەشکە؛ هەنگوورە؛ مێشەنگوینی دەغەڵ کە هەنگوین ناکا ⵉ زنبور بی‌عسل

**هەنگەبەر** / hengeber/: ناو. فاتمەداروو؛ گوڵەبەنۆشەک ⵉ فرنجمشک

**هەنگەچنە** / hengeç(i)ne/: ☜ **هەنگەچینە**

**هەنگەچین** / hengeçîn/: ☜ **هەنگەچینە**

**هەنگەچینە** / hengeçîne/: ناو. هەنگچنە؛ هەنگخۆرکە؛ هەنگخۆرە؛ هەنگۆچنە؛ هەنگەخۆرکە؛ هەنگەخۆرە؛ هەنگەچنە؛ هەنگەچین؛ هەنگەوچنە؛ حەوڕەنگیلە؛ ڕەنگڕێژە؛ هەفتڕەنگیلە؛ مێشخۆرە؛ هەنگەژالەخۆرە؛ پەلەوەرێکی ڕەنگامەی کۆمەڵژی، بە جەستەی باریک، بە باڵ و کلک و دەنووکی درێژ و باریکەوە کە مێروان بەتایبەت مێشەنگوین دەخوا ⵉ

زنبورخوار

**هەنگەخۆرکە** / hengexorke/: ☜ هەنگەچینە

**هەنگەخۆرە** / hengexore/: ☜ هەنگەچینە

**هەنگەڕەشکە** / hengeřeşke/: ☜ هەنگەبۆڵە

**هەنگەڕەشە** / hengeřeşe/: ناو. شەمەتریکە؛ جۆرێک هەنگی ڕەش و باریکە ▤ زنبور سیاه

**هەنگەژاڵ** / hengejał/: ناو. ١. خەڵیف؛ پلوورە ٢. مێشەنگوین لە قەڵشتەبەردی شاخدا ▤ ١. کندوی زنبور ٢. گروه زنبورعسل در شکاف صخره

**هەنگەژاڵە** / hengejałe/: ناو. هەنەژاڵە؛ هەنەژاڵە: ١. هەنگ؛ مێشەنگوین ٢. زەردەواڵە ▤ ١. زنبور عسل ٢. زنبور

**هەنگەژاڵەخۆرە** / hengejałexore/: ☜ هەنگەچینە

**هەنگەشەلە** / hengeşele/: ناو. هەنگەشەلێ؛ کاری لاقێک هەڵگرتن و لە سەر لاقێک بە نیوەباز ڕۆیشتن ▤ لی ـ لی

**هەنگەشەلێ** / hengeşelê/: ☜ هەنگەشەلە

**هەنگەلان** / hengelan/: ☜ هەنگەڵان

**هەنگەڵان** / hengełan/: ناو. هەنگەلان؛ هەنگەژاڵە؛ جێگەی مێشەنگوین لە شاخدا ▤ زیستگاه زنبور عسل در شکاف صخره

**هەنگەماڵ** / hengemał/: ناو. شانەی هەنگوین ▤ شانەی عسل

**هەنگەمە** / hengeme/: ناو. هەرا و هوریا؛ زەنا ـ زەنا ‹بوو بە هەنگەمەیەک مەپرسە!› ▤ همهمه

**هەنگەمین** / hengemîn/: ☜ هەنگوین

**هەنگەوان** / hengewan/: ناو. ڕاگر و بەخێوکەری هەنگ. هەروەها: **هەنگەوانی** ▤ زنبوردار

**هەنگەوچنە** / hengewç(i)ne/: ☜ هەنگەچینە

**هەنگەوِن** / hengewin/: ناو. هەنگەوەن؛ هەنگەونە؛ گوێنی؛ گەون ▤ گَوَن

**هەنگەونە** / hengew(i)ne/: ☜ هەنگەوِن

**هەنگەوەن** / hengewen/: ☜ هەنگەوِن

**هەنگی** / hengî/: ئاوەڵکار. ئەودەم؛ ئەوسا ▤ آنگاه

**هەنگیر** / hengîr/: ☜ هەنگور

**هەنگین**[1] / hengîn/: ☜ هەنگوین

**هەنگین**[2]: ئاوەڵکار. ئەوسا؛ ئەودەم؛ هەنگی ▤ آنگاه

**هەنگینی** / hengînî/: ئاوەڵکار. هەینێ؛ ئەوساکە ▤ آنگاه؛ سپس

**هەنگینێ** / hengînê/: ئاوەڵکار. ئەوساکە ▤ آنگاه

**هەنگێز** / hengêz/: ناو. ↓

⊡ **هەنگێز دان:** هێز پێ دان ‹هەنگێزیان دا و بە دوای خۆیاندا ڕایانکێشا› ▤ قوّت بخشیدن

**هەنگێزە** / hengêze/: ناو. ١. قوڵفی دەسکی خورج و جەواڵ ٢. کێلی قەبر ٣. بن کێلی قەبر ٤. هانە؛ بزوێنە ▤ ١. دستگیرەی جوال و خورجین ٢. سنگ قبر ٣. پای سنگ قبر ۴. انگیزه

**هەنگێوران** / hengêwran/: ☜ ئەنگێوران

**هەننی** / hennî/: ☜ هەنی

**هەنوان** / henwan/: ☜ هەنوون

**هەنوین** / henwîn/: ☜ هەنگوین

**هەنۆ**[1] / heno/: ئاوەڵکار. ئەم ئەندازە ▤ این‌قدر

**هەنۆ**[2]: جێناو. ئەمە ▤ این

**هەنوو** / henû/: ناو. ساولووسە؛ کاری ساف کردن ▤ صیقل

⊡ **هەنوو دان:** تیف‌تیفەدان ‹ڕیشی وا هەنوو داوە کێچ بووکەسوواتی لێ دەکا!› ▤ صیقل دادن

**هەنووکە** / henûke/: ئاوەڵکار. ١. نهۆ؛ ئێستە؛ نوها ٢. واک؛ وانێک؛ تشت؛ هەرامە؛ هین ▤ ١. اکنون ٢. چیز

**هەنوون** / henûn/: چاوگ. هەنوان؛ هەنین؛ تێساوین و توند بە دەست ماڵین ‹پشتت بە هەتوان بهەنووا› ▤ مالیدن دارو بر پوست

**هەنوونێ** / henûnê/: ناو. وتەیەکی جادوگەرانەیە لە چیرۆکی کۆندا ‹هەنوونێ مەنوونێ، خەزێنەی پاشام بە قوونێ!› ▤ کلمەی جادویی در داستان‌های

قدیمی

**هەنویر** / henûyr/: ☜ **هەنگوور**

**هەنە** / hene/: ناو. ١. ☜ **هەوێ** ٢. خەنە؛ هونە ٣. هەندەر؛ دارێکی ئەستوور لە دەسگای تەونـدا ☰ ١. ☜ **هەوێ** ٢. حنا ٣. چوبی در دار قالی

**هەنەر** / hener/: ناو. ١. ☜ **هونـەر** ٢. دەرەوە ☰ ١. ☜ **هونەر** ٢. بیرون

**هەنەران** / heneran/: ☜ **هەندەران ـ١**

**هەنەزا** / heneza/: ناو. ئەنەزا؛ هەنەزاگ؛ حەنـەزا؛ تۆرە؛ زارۆی هەوێ ☰ هووزاده

**هەنەزاگ** / henezag/: ☜ **هەنەزا**

**هەنەژاله** / henejale/: ☜ **هەنگەژاڵە**

**هەنەژاڵە** / henejałe/: ☜ **هەنگەژاڵە**

**هەنەفی**[1] / henefî/: ناو. مریشکاوی؛ باڵـدارێکە لـە تیرەی مراوی ☰ پرندەای از خانوادەی مُرغابی

**هەنەفی**[2]: ☜ **حەنەفی**[2]

**هەنەک** / henek/: ناو. ١. ☜ **حەنـەك** ٢. چەنـە؛ چەناگە؛ چناکە ☰ ١. ☜ **حەنەك** ٢. چانە

**هەنەکچی** / henekçî/: ☜ **حەنەکچی**

**هەنەکە** / heneke/: ☜ **هندەکۆ**

**هەنەکی** / henekî/: ☜ **حەنەکچی**

**هەنەهن** / henehin/: ناو. نخەنخ؛ هەناسەسـواریی ماندوو ☰ هِن ـ هِن

**هەنەهەپسێ** / henehepsê/: ناو. کـاری دم لـە دم نان ☰ مُشاجره

**هەنهۆ** / henho/: ئاوەڵکار. هەنهە: ١. هەر ئێسـتە ٢. دەسبەجێ ☰ ١. هم‌اکنون ٢. بی‌درنگ

**هەنهە** / henhe/: ☜ **هەنهۆ**

**هەنی**[1] / henî/: ناو. ١. هەندی؛ هـەینی؛ شـووتی؛ شامی؛ شفتی؛ جەبەژ؛ شمتی ٢. دۆز؛ بیر و بـڕوا ٣. ڕۆژائین؛ جوعمـە؛ هـەینی ٤. تـوێڵ؛ تـەوێڵ؛ ئەنی؛ ناوچاوان ٥. کانی؛ سەرچاوە ☰ ١. هندوانە ٢. عقیده و مرام ٣. آدینه ۴. پیشانی ۵. چشمه

**هەنی**[2]: ئاوەڵکار. ١. ☜ **هێشتا** ٢. ئیتـر؛ ئیـدی ‹جە دمای شیرین شۆخ دیدە مەی/ هەنی زینگـانیم کافین وەسەن وەس «میرزا شەفیع پاوەیی»› ٣. لـە پڕ؛ لە نکاو ٤. بڕێک؛ هەندێک ٥. پتر؛ زیاتر ☰ ١. ☜ **هێشتا** ٢. دیگر ٣. ناگهان ۴. اندکی ۵. بیشتر

**هەنیپێچ** / henîpêç/: نـاو. توێڵبەند؛ ئەنی‌بەند ☰ هِدبند

**هەنیسک** / henîsk/: نـاو. هەنســک؛ خیســک؛ نزگـەرەی بـە گریانـەوە ‹هەنیسـک و هەناسـەی بەتەوژم و پڕ لە تاسە، ملیان بـە ملـی یەکـەوە نـابوو، بەربینگیان لێ گرتبووم و پەڵپیان پێ گرتبـووم و بـۆ سـەرکەوتن و دەرکـەوتن ملـەیان دەکـرد و لـەز و پەلـەیان بـوو «هـەژار، *شـەرەفنامە*»›. هـەروەها: **هەنیسک دان** ☰ سکسکەی حین گریە

**هەنیشخ** / henîşx/: ☜ **ئانیشك**

**هەنیشک** / henîşk/: ☜ **ئانیشك**

**هەنیشکە** / henîşke/: ناو. ئانیشکە ☰ لولەی زانویی

**هەنین** / henîn/: ☜ **هەنوون**

**هەنیە** / henye/: ناو. هەنییە؛ توێڵ؛ تەوێڵ؛ ئـەنی؛ ناوچاوان ‹مانگ لە ئاست هەنیەی شـەرمەزار بـۆوە/ برۆی دی هیلال، خۆی لە بـیر چـۆوە «هـێمن»› ☰ پیشانی

**هەنیەهەڵگر** / henyehełgir/: نـاو. ڕوومـەتگیر؛ کەسێ کاری هەڵگرتنی مووی ڕوومەتی ژنانە ☰ آرایشگر (زنانە)

**هەنی ـ هەنی** / henî henî/: ئاوەڵناو. هەلا ـ هـەلا؛ داوەشاو ☰ لە و از هم پاشیده

**هەنییە** / henîye/: ☜ **هەنیە**

**هەنییەکۆڵە** / henîyekołe/: نـاو. شووتی چکۆلەی دێم ☰ هندوانەی دیمی

**هەنێ**[1] / henê/: ئاوەڵکار. ئاوا؛ ئاوها ☰ چنین

**هەنێ**[2]: ☜ **هەندێ**

**هەنێن** / henên/: ئاوەڵکار. بـەو جـۆرە؛ ئاوهـایی؛

ئاوائاوایی 🇮🇷 آن‌طور

**هەو**[1] / hew/: ناو. ١. جار؛ کەڕەت؛ هەل ٢. ڕەوتی گەڕانەوە ٣. فێڵ؛ حیلە ٤. چلک؛ کێم و زووخ ٥. شالاو؛ پەلامار ٦. شەپلـە لـە ئەنـدامی لـەش ٧. خەو؛ خـەون ٨. خەوخـەون؛ ئـەوی لـە زەیـنی مـرۆی خـەوتوودا ڕوو دەدا ٩. کـاری خـەنین؛ پێکـەنین 🇮🇷 ١. بـار؛ دفعـە ٢. بازگشـت ٣. نـارو ۴. عفونت؛ ریم و چرک زخم ۵. حملە ۶. فلجی ۷. خواب ۸. رویا ۹. خندە

⊡ **هەو خستن:** لێک کۆ کردنەوە؛ کردنە یـەک 🇮🇷 دورهم جمع کردن

**هەو دان:** پەلامار دان 🇮🇷 حملە کردن

**هەو کردن:** ١. قەتماغـە پەڕینـە سـەر بـرین ٢. عفوونەت کردن؛ کێم و زووخاو لە برین هـاتن ‹قەت بە گۆشتەوزوون نـەزانی قەرتماغـەی زامـی دڵ/ پێستەکەی لێ لادە بێخود تێ‌ئەگەی کردوویە هەو «بێخود»› 🇮🇷 ١. خشک ریشە روی زخم ایجاد شدن ٢. عفونت کردن؛ ریم و چرک از زخم بیـرون زدن

**هەو**[2]: ئاوەڵناو. ١. تەرە؛ تاراو؛ ڕەویو ٢. بەس؛ چیتر نا ‹ئەوەندەت دەدەمێ و هـەو، ئیـدی مەیـەوە!؛ دوو دەقیقەم لابە و هەو› 🇮🇷 ١. رمیدە ٢. بس

⊡ **هەو بوون:** ئیتر نەهاتنەوە 🇮🇷 یکبارە رفتن

**هەو**[3]: جێناو. ئەو؛ هۆوە ‹وەمزانی هەوە، هـەو نـەبوو› 🇮🇷 او

**هەو**[4]: دەنگ. ١. وشەی سەیرمان بـۆ زیـان ‹هـەو، لێم ڕژا!› ٢. وتەی ڕاوکەران لە جەنگـەی نـێچیر دانـە بـەردا ٣. دەنگـێ بـۆ بانـگ کـردن و لا کردنەوەی گاجووت لە کاتی جووت کردندا 🇮🇷 ١. وا؛ حرف تعجب ٢. صوت شـکارچیان هنگـام تعقیـب شکار ٣. صوتی برای بازگرداندن گاو شخم

⊡ **هەو کردن:** لێخوڕین و گەڕاندنەوەی گـاجووت 🇮🇷 هدایت کردن گاو شخم

**هەو کردنەوە:** *[کینایە]* گەڕانـەوە؛ هاتنـەوە سـەر دۆخی جاران یـا هاتنـەوە شـوێنی پێشـوو 🇮🇷 مُراجعت کردن

**هەو لێ کردن:** هەرا کردن لە نێچیر 🇮🇷 سروصـدا کردن برای رماندن شکار

**هەوا**[1] / hewa/: نـاو. ١. با؛ باد؛ بێ ‹لەم کونەوە هەوا دێت› ٢. بڵـندایی لـە زەویـن بـەرزتر ‹دەس لـە زەوی، پا لە هەوا؛ لە هەواوە گرتییەوە› ٣. ئاسمـان؛ عاسمـان ‹ئـەو هـەموو ئەسـتێرە لـەو هەوایـە، کـێ ڕایگرتـوون؟!› ٤. چۆنیـەتی بـارودۆخی کـەش ‹هەوای بەهاری؛ هـەوای سـارد› ٥. تێکەڵـێک لـە چەند گاز بە دەوری گۆی زەویدا ‹گیاندار بێ هەوا ناژی› ٦. ئیشتیا و تاسە ‹تۆ کەم‌نەزەری دەرحەقی من ئێستەکە ئاغا!/ من ماومە هـەوای سـوحبەتی تـۆ هەر لە دەماغا «شـێخ ڕەزا»› ٧. فیـز؛ بادیهـەوایی؛ دەعیە ‹لەم حوجرەیی شەش‌گۆشە کە ڕێ مەعبەری عامە/ یاڕەب چییە؟ هەرکەس بە هەوا و هەوەسـێکە! «تاهیر بەگ»› ٨. قامی گۆرانی ‹خوڕخوڕی ئاوە لە بـەفری سـەرکەل/ خـۆش هـەوای تێکەڵـە زەنگـی سـەرگەل «هـەژار، *بـۆ کوردسـتان*»› ٩. بـا؛ هـەو؛ وەرهەم؛ ماس؛ دۆخی ماسین و ئەسـتوور بـوونی ئەندام ‹دەم و چاوی تۆزێ هەوای هەیـە› 🇮🇷 ١. بـاد ٢. بالاتر از سطح زمین ٣. آسمان ۴. آب‌وهـوا ۵. جـوّ زمین ۶. اشـتیاق و آرزو ۷. تکبُـر ۸. آهنـگ ترانـە ۹. آماس

⊡ **هەوا بوون:** لـە کـار کـەوتنی ئەنـدامێک لـە ئەنـدامانی لـەش 🇮🇷 از کـار افتـادن عضـوی از اعضای بدن

**هەوا خواردن:** هەوا لێ‌کەوتن؛ هەوا دان؛ کەوتنە بەر ڕەوتی هەواوە ‹لیباسەکان هەڵخە تۆزێ هەوا بخۆن› 🇮🇷 هوا خوردن

**هەوا دان:** هەوا داییش؛ حـەوا دان؛ بـەرەو ژوور ئاوێتن 🇮🇷 پرتاب کردن

**هەوا دایێش:** ☜ **هەوا دان**

**هەوا کردن:** ١. بـا کـردن؛ پەنـەمان؛ ماسـینی لەش؛ ئەستوور بوونی ئەندام لـە نەخۆشـی ٢. توورِاندنـە زورنـا و بلـوێر و ئـامرازیـتـردا ☰ ١. آماسیدن اعضای بدن ٢. دمیدن در آلات موسیقی بادی

**هەوا کێشان:** با کردن و ئەستوور بوونی برین ☰ آماسیدن زخم

**هەوای شتێ کردن:** *[مەجاز]* دڵ لە شتێکەوە بوون؛ تاسەی شتێک کردن ‹ئەم هەموو دنیایە خاسـی حـوکمی دوو دێوانەیـە/ مـن لـە شـارم غایـەتی مەجنوون هەوای لادێ دەکـا «حـاجی قـادر»› ☰ آرزوی چیزی را داشتن

**هەوای شتێ کەوتنە سەر:** خەیاڵـی شـتێ دانـە سەری کەسێک ‹کەوتوەتە سەرم هـەوای یـاری نۆ/ یا بۆ وەیس ئەچم یا بۆ بـاینچۆ «فولکلـۆر»› ☰ هوای چیزی به سر زدن

**هەوا**[٢]: ئاوەڵکار. کـەم ‹یـەک هـەوا بچـۆ دواوە› ☰ اندک

**هەوابڕ / hewabiř/:** ئاوەڵناو. *[کینایە]* تایبەتمەنـدی دیوار و خانووی بڵند ☰ ویژگی دیوار و خانەی بُلند

**هەوابەر / hewaber/:** ☜ **هەواکێش ـ٢**

**هەواپێو / hewapêw/:** نـاو. ئـامرازی ئـەزموونی توندی و سستی با ☰ بادسنج

**هەواجیوە / hewacîwe/:** نـاو. ڕەگـی دارێکـە بـۆ دەرمـان دەشـێ ☰ ریشـەی درختـی کـە مصـرف دارویی دارد

**هەواخوا / hewax(i)wa/:** ئاوەڵناو. داژدار؛ لاگـر ☰ هواخواه

**هەواخۆر / hewaxor/:** ناو. کون لە دیـواردا بـۆ بـا هاتنە ناو ماڵەوە ☰ بادگیر

**هـەواخۆش / hewaxoş/:** ئاوەڵـناو. هـــەوادار؛ تایبەتمەندی جێگەی سازگار ☰ خوش آب و هوا

**هەوادار / hewadar/:** ئاوەڵناو. ١. ئەڤیندار؛ عاشـق ٢. بەدەعیە؛ بادیهەوا؛ بـەفیز ٣. هـەواخۆش ٤. لاگر؛ داژدار؛ هەواخوا ٥. بە کێم و زووخ ‹دمـەڵ و زام› ☰ ١. عاشـق ٢. مُتکبـر ٣. خـوش آب و هـوا ۴. طرفدار ۵. دارای ریم و چرک (دُمل و زخم)

**هەوار / hewar/:** ناو. هەڤار: ١. هاوار؛ فریا ٢. وار: *ئا)* هاڤـینگە؛ هاڤـینەوار؛ هاڤـینەهەوار؛ هاوینگـە؛ هاوینەوار؛ هاوینەهەوار *ب)* زۆزان؛ زستانەوار ‹دێم بەرەو هۆبە و هەواری باسەفا/ دێم بەرەو لادێ، بـەرەو کانگای وەفا «هێمن»› ٣. هەوارگە؛ جێگەی مانەوە ‹مـن هـەروا بـووم تـا دێتـە بـیرم/ تـا ڕۆژی مـردن شارەوشارم/ ڕێبوارم بێهەوارە «سوارە»› ☰ ١. فریـاد ٢. ییلاق/ قشلاق ٣. سکونتگاه

⊡ **هەوار چوون:** ڕۆیشتن بـۆ بانەمـەڕان ☰ یـیلاق رفتن

**هەوار خستن:** نیشتەجێ بوونی کاتی لە شـوێنێ ‹تا پایزی ئەو ساڵە ڕوو ئەکەنە چەمی بیارە و لەوێ لە باخێکدا هەوار ئەخەن و ... «مەحەمـەدی مـەلا کەریم»› ☰ اُتراق کردن

**هەوار کردن:** ١. هاوار کردن ٢. چوونە کوێستان ☰ ١. فریاد زدن ٢. رفتن به ییلاق

**هەوارچی / hewarçî/:** ئاوەڵـناو. ڕەوەنـد؛ کۆچـەر؛ خێڵەکی ‹حۆری بەهەشتن دەچن بۆ خێڵـی/ هـاوار هەوارچی بەجێم نەهێڵی! «حەقیقی»› ☰ یـیلاقرو؛ کوچنشین

**هەوارگا / hewarga/:** ☜ **هەوارگە**

**هەوارگە / hewarge/:** ناو. هەوارگا؛ وارگە؛ جێگەی ژیان لە کوێستان ‹چ بـێنـازن هەوارگـەی شـۆخ و زەنوێر/ چ ناسازن چیا و لاپاڵ و هەڵدێر «هێمن»› ☰ سکونتگاه فصلی

**هەوارنشین**[١] / **hewarn(i)şîn/:** ناو. ئەوەی ژیانی لە هەواردا بە سەر دەبا ☰ ییلاقنشین

**هەوارنشین**[٢]: ئاوەڵناو. خـاوەن ژیـانی هەوارنشـینی

‹جە کۆن نزاران هەوارنشینان/ خەیمە و خیابان ئـەو نازەنینان «خانای قوبادی»› 🇮🇷 ییلاق‌نشین

**هەوارنشــینی** / hewarn(i)şînî/: نــاو. ژیـــانی کۆچەرایەتی کـە بـە کۆمـەڵ بـە هـۆی گـەرانی وەرزی ســاڵ و بــە بۆنـەی لـەوەر یـان ڕاوەوە گەرمیان و کوێستان دەکـرێ 🇮🇷 ییلاق‌نشینی؛ زندگی ییلاق و قشلاق

**هەوارۆ** / hewaro/: نزا. ئەی هاوار 🇮🇷 ای داد

**هەوارمەڕ** / hewaremeř/: ناو. کۆتـان؛ کۆتـاک؛ پەچەمەڕ 🇮🇷 شبغاز

**هەواری**[1] / hewarî/: نـاو. چـادری زۆر گــەورە 🇮🇷 خیمەی بزرگ

**هەواری**[2]: ئاوەلناو. سەر بە هەوار 🇮🇷 ییلاقی

**هەواشناسی** / hewaşinasî/: ☜ **هەواناسی**

**هەواکێش** / hewakêş/: ناو. ١. خەفەنگ؛ دەلاقـە؛ حولووربا؛ کونەبا؛ دەراوێک بۆ دەرچوونی هەوا لـە شــوێنێکی بەســراودا ٢. هەوابــەر؛ هــەواگۆڕ؛ کەرستەیەکی وەک پەنکـە بـۆ ڕاوەنـانی هـەوای خـراپ و هێنانــە ژووری هــەوای بــاش 🇮🇷 ١و٢. هواکش

**هەواگا** / hewaga/: ناو. جێگەی بڵندی سازگار 🇮🇷 جای بُلند خوش آب و هوا

**هەواگۆڕی** / hewagořî/: ناو. بـاگۆڕی؛ بـاگهۆڕی. هەروەها: **هەواگۆڕ** 🇮🇷 تهویه

**هەوالـە** / hewale/: نـاو. ١. ☜ حــەوالــە ٢. بەرهەیوان؛ پێش‌پەنجـەرە 🇮🇷 ١. ☜ حـەوالـە ٢. بالکن

**هەواڵ** / hewał/: ناو. ١. خەبـەر؛ خـەوەر و بـاس ‹سەحەر ڕاهی بی وە سەر دیـارێ/ مەپەرسـا هـەوال جە ڕوایارێ «خانـای قوبـادی»› ٢. ئـاواڵ؛ دۆسـت ‹زۆرم حەول دا کە چەند هەواڵێکم دەگەڵ بێ بەڵکو لەو تالانە تفەنگمان دەسکەوێ، کەس نەهات «هەژار، چێشتی مجێـور»› ٣. چلۆنـەتی حـاڵ و ئـەحوال ‹داخۆ ئەم ڕۆژانە هەواڵی ناوشاری عـەفرین چییـە؟› 🇮🇷 ١. خبر ٢. دوست ٣. حال و احوال

▣ **هـەواڵ بـون:** خەبـەر بـوون؛ دەنـگ و باسـی هەبوون 🇮🇷 خبر بودن

**هەواڵ پرسین:** لە حاڵ‌وباڵ پرسین ‹چ ئیسـتیغنا، چ وەحشی تەبعییکە/ نەپرسـی تـۆ هەواڵـی ئاشـنا قەت؟! «مەحوی»› 🇮🇷 احوالپرسی کردن

**هەواڵ دان:** خەبەر دان؛ ئاگادار کـردن ‹هەواڵـی هاتنیان داوە› 🇮🇷 خبر دادن

**هەواڵ (لێ)زانین:** ١. ئاگـادار بـوون ‹هەواڵـی ئـەزانی؟› ٢. خەبـەر گـرتن ‹دا بـڕۆ هەواڵـێکی بزانە!› 🇮🇷 ١. خبر داشتن ٢. خبر گرفتن

**هەواڵبەر** / hewałber/: ناو. پەیامبـەر؛ قاسـید 🇮🇷 پیامرسان

**هەواڵبێژ** / hewałbêj/: ناو. بێژەری هەواڵی ڕادیـۆ و تەلەفیزیون 🇮🇷 گویندەی خبر

**هەواڵپرس** / hewałpirs/: ئاوەلناو. ١. خەبـەرپرس؛ شوێنگری خەبەروباسان ٢. حاڵ‌پرسی دیتران 🇮🇷 ١. جویای خبر ٢. احوالپرس

**هەواڵپرسی** / hewałpirsî/: ناو. ١. کاری پرسـینی خەبەر ٢. کاری پرسینی حاڵی کەسێ. هەروەها: **هەواڵپرسی کردن** 🇮🇷 ١. عمـل جویـا شـدن خبـر ٢. احوالپرسی

**هەواڵدوانە** / hewałd(i)wane/: ئاوەلناو. جووتـە؛ لفەدوانە 🇮🇷 دوقلو

**هەواڵدەر** / hewałder/: ناو. هەواڵنێر؛ خەبـەردەر؛ کەسێ کە بۆ دامەزراوەی سـەر یـەک خسـتن و ڕاگەیاندنی هەواڵ، دەنگ و باس کۆ دەکاتەوە 🇮🇷 خبرنگار

**هەواڵمنـداڵ** / hewałmindał/: نــاو. پـــەردەی منداڵدان 🇮🇷 جُفت نوزاد

**هەواڵنێر** / hewałnêr/: ☜ **هەواڵدەر**

**هەواڵـەتی** / hewałetî/: نـاو. ئاواڵـەتی؛ دۆسـتی؛

ڕەفیقایەتی ☰ رفاقت

**هەوان**[1] / hewan/: ☜ **هەنبانە**

**هەوان**[2]: ئاوەڵناو. ڕەبەن؛ سپاتە؛ بێ هاوسەر و ماڵ ☰ مُجرد بی‌خانه و کاشانه

**هەواناس** / hewanas/: ناو. پسپۆڕ لە چلۆنایەتی کەشدا ☰ هواشناس

**هەواناسی** / hewanasî/: ناو. هەواشناسی؛ کەشناسی: ١. زانستی لێکدانەوەی دیاردەگەلی کەش (وەک هەور، با، باران، گەرما، سەرما و ...) ٢. مەزرینگەی تایبەت بەو کارە ☰ ١. هواشناسی ٢. ادارەی هواشناسی

**هەوانتە** / hewante/: ئاوەڵناو. ١. ئاوانتە؛ مفتە ‹نانی مەردانە بخۆ ئیقرار ئەکەم حاتەم کە تۆی/ بۆ هەوانتە تێ‌مەکۆشە! ئەو زەمانە هات و ڕۆیی «قانع»› ٢. بەخۆڕایی؛ بێ‌فایدە ☰ ١. مُفت ٢. بیهوده

**هەوانتەچی** / hewanteçî/: ☜ **هاوانتەچی**

**هەوانچە** / hewançe/: ناو. هەنبانۆکە؛ هەنبانەی گچکە ☰ انبانچه

**هەوانە** / hewane/: ☜ **هەنبانە**

**هەوای** / heway/: ناو. لاسا ☰ تقلید

**هەوایی**[1] / hewayî/: ناو. ١. نهۆمی بالاخانە ٢. ئەلیا؛ ئەلها؛ کەلکەلە ‹عیشقبازی و هەوایی دەروێشی/ میللەتی خستە فەقر و دەروێشی «حاجی قادر»› ☰ ١. طبقەی بالایی ساختمان ٢. هوس

**هەوایی**[2]: ئاوەڵناو. ١. ئەڤینداری لە دڵداریدا شێتبوو ٢. سەربزێو؛ سەرکێش؛ یاخی ‹هەوایی بوون› ٣. لاژگ؛ گەللایی و گوێنەدەر ‹کوڕی چی؟ لاتێکی دەمدەمی و هەوایی› ٤. غەیری زەوینی ‹سەفەری هەوایی› ٥. ئاسمانی ‹ئەمە بۆی نەسیمی بەهارە، یا خەبەری سرووشی هەواییە/ دەمی ڕۆحبەخشی نیگارە، یا نەفەسی مەسیحی سەماییە؟ «بێخود»› ☰ ١. واله و شیدا ٢. یاغی ٣. دبنگ ۴. هوایی ۵. آسمانی

**هەواییش** / hewayîş/: چاوگ. پێخەنین؛ کەنین؛ پێکەنین؛ خەنە کردن ☰ خندیدن

**هەوبەر** / hewber/: ناو. بەری جلک؛ هاسەر ☰ آستر

**هەوبەڵێ** / hewbełê/: دەنگ. بەڵێ؛ بەرێ ☰ بلی

**هەوت**[1] / hewt/: ☜ **حەوت**

**هەوت**[2]: ئاوەڵناو. گێژ؛ گێج ☰ گیج؛ متحیر

**هەوتا** / hewta/: ☜ **هاوتا**

**هەوتاش** / hewtaş/: ناو. سەرۆکی ئێشکگران ☰ سرکشیک

**هەوتانایش** / hewtanayş/: ناو. بوێری؛ ئازایەتی ☰ شُجاعت

**هەوتای** / hewtay/: ☜ **حەفتا**

**هەوتاین** / hewtayn/: ☜ **حەفتامین**

**هەوتسەی** / hewtsey/: ☜ **حەوسەد**

**هەوتک** / hewtik/: ناو. دەفری گلینی خۆراکی سەگان ☰ ظرف گلین ویژەی خوراک سگ

**هەوتن** / hewtin/: ☜ **حەوتم**[2]

**هەوتویش** / hewtûyş/: ناو. بەسەرهاتی ناخۆش ☰ پیشامد ناگوار

**هەوتە** / hewte/: ☜ **حەوتوو**

**هەوتێس** / hewtês/: ☜ **حەڤدە**

**هەوجار** / hewcar/: ناو. هێش؛ هەلا؛ ئەوجاڕ؛ ئامووڕ ☰ خیش

**هەوجاڕ** / hewcař/: ناو. ئامووڕ؛ ئەسپابی جووت ☰ خیش

**هەوجە** / hewce/: ناو. حەوجە؛ نیاز ☰ احتیاج

**هەوجەدار** / hewcedar/: ئاوەڵناو. ئاتاج؛ دەسکورت ☰ مُحتاج

**هەوجەر** / hewcer/: ناو. ئاستەڕ ☰ آستر

**هەوچی** / hewçî/: ئاوەڵناو. ئاژاوەچی؛ بەشەڕوگەڕ ☰ هوچی

**هەود** / hewd/: ناو. ١. ☜ **هەودەك** ٢. ☜ **حەوز**

**هەودا** / hewda/: ناو. ١. تا؛ تاڵ؛ داو ‹شیعری خەلقی کەی دەگاتە شیعری من، بۆ نازکی؟/ کەی لە دیققەتدا، پەتک دەعوا لەگەڵ هەودا دەکا؟ «نالی»› ٢. چەند وشەیەک کە بە یەک هەناسە دەگوترێ ☰ ١. تار؛ تار نخ و موی ٢. کلامی کە با یک نفس ادا شود

**هەودوو** / hewdû/: جێناو. هەڤدوو؛ ئێکتر؛ یەکتر ☰ همدیگر

**هەودەک** / hewdek/: ناو. هەود؛ ڕکە؛ بیرکم؛ قەفەز ☰ قفس

**هەودەل** / hewdel/: ناو. ١. شۆربای لە وردەساوار و ئارد بۆ چێلی تازەزاو ٢. تەپەدوور؛ تەپەدۆر؛ چێوپەمە؛ چووپەمە؛ چۆپەمە؛ ☰ ١. نوعی آش برای گاو زائو ٢. چوب‌پنبه

**هەور** / hewr/: ناو. هەڤر: ١. عەور؛ مژی تۆخ و بەرزەوەبوو کە بارانی لێ دەڕژێتە خوار ‹هەورێکی هێنا بارانی پێوە/ یا خوا نەبارێ یار ها بە ڕێوە «فولکلۆر»› ٢. هەورک؛ هەوری؛ سونگەر؛ کەرەور؛ ئیسفەنج؛ شتێکی نەرمی کون-کونە بۆ دۆشەک، سەرین، سەندەڵی، ماشین و... بە کار دەچێ ٣. گۆمی قووڵ ٤. مێرگۆلەی پچووک لە نوالی چیادا ☰ ١. ابر ٢. اسفنج ٣. ژرفاب عمیق ۴. مرغزار کوچک در کوهستان

▣ **هەوری بارین**: هەورێ بارانێ؛ هەورێ پڕ؛ هەوری پڕ؛ هەورڕەشتالەی زگپڕ کە بۆی هەیە ببارێت ☰ ابر بارانزا

**هەوری پڕ**: ☜ **هەوری بارین**

**هەورێ بارانێ**: ☜ **هەوری بارین**

**هەورێ پڕ**: ☜ **هەوری بارین**

**هەورێ تەنک**: سووکەڵە هەور ☰ ابر رقیق

**هەورێ ڕەش**: هەوری پڕ و توند ☰ ابر غلیظ

▣ **هەور کردن**: زۆر بوون و تێکهەڵانی هەوران ‹هەوری کردووە، بەشکوو بارانێکی باش ببارێ› ☰ ابری شدن

**هەورا**[1] / hewra/: ناو. کاهووی کەژی؛ گیایەکی یەکسالانەی زستانی کە بە توو زیاد دەکا ☰ کاهوی خاردار

**هەورا**[2]: ناوەڵناو. برچی؛ برسی؛ نێز ☰ گُرُسنه

**هەوراز** / hewraz/: ناو. ئافراز؛ ئاڤراز؛ ئەرڤاز؛ ئەرواز؛ ئەوراز؛ هەڤراز؛ هەورازی؛ ڕکە؛ بەرەو ژوورە ‹ئیش کە ڕووی ئێستە لە هەورازە سەرەولێژی نەکەی!/ فیکری وردیشی ئەوێ، هەر بە دوعا و نوێژی نەکەی! «شوکری فەزلی»› ☰ سربالایی

▣ **هەوراز لێکردن**: خۆ هەڵکێشان ☰ لاف زدن

**هەورازی** / hewrazî/: ☜ **هەوراز**

**هەورامانی** / hewramanî/: ناوەڵناو. پەیوەندیدار یان سەر بە ناوچەی هەورامان ‹شالی هەورامانی؛ کلاشی هەورامانی› ☰ اورامی

**هەورامی**[1] / hewramî/: ناو. ١. خەڵکی ناوچەی هەورامان ٢. لە زمانە بنەڕەتییەکانی کورد و کوردستان ☰ ١و٢. اورامی

**هەورامی**[2]: ناوەڵناو. پەیوەندیدار بە هەورامییەوە ‹نانی هەورامی؛ کلاشی هەورامی› ☰ اورامی

**هەوران** / hewran/: ناو. ١. هەڤران؛ شاتان؛ سپیندار؛ ئەسپیندار ٢. ئاسمانی بە هەور ☰ ١. سپیدار ٢. آسمان ابری

**هەورایی** / hewrayî/: ناو. ١. برچیتی؛ برسیایەتی ٢. دۆخی بە هەور بوون ☰ ١. گُرُسنگی ٢. حالت ابری

**هەوربردوو** / hewrbirdû/: ناوەڵناو. هەوربردە؛ لە هەور زیان دیتوو (میوە و دەخڵ) ‹گزگڵ و خڕنووک و مازوو و پانکە و سیچکە و کەڵنج/ پۆزەخووگە و هەمزەئاغا هەوربردوو، شاخدار! «قانع»› ☰ ابرزده (میوه و غله)

**هەوربردە** / hewrbirde/: ☜ **هەوربردوو**

**هەورس** / hewris/: ناو. هەوریس؛ هەوڕێس؛

تۆرەمەی کۆتر، نزیک ٢٧ سانتیمیتر دەبێ، کلکی لە کۆترەباریکە درێژتر، پشتی قاوەیی کاڵ، پاشەستۆی خەتی پێدا کێشاوە، مل و بەر زگی کاڵ، چاوی سوورە و لە سەر دار و خانوو هێلانە دەکا ☰ یاکریم

**یاکەند** / yakend/: ☜ **یاقووت**

**یاگۆبان** / yagoban/: ناو. پێخەف؛ جێگەوبان ☰ رختخواب

**یاگە** / yage/: ناو. جێگە ☰ مکان؛ جای

**یاگی** / yagî/: ناو. ئاگر ☰ آتش

**یاگێ** / yagê/: ناو. ١. پێگە ٢. جێگا ☰ ١. جا ٢. جایگاه

**یال** / yal/: ☜ **یاڵ**

**یالخ** / yalix/: ناو. مێزەر؛ شاشک؛ پێچی سەری پیاوان ☰ دستار مردانه

**یالدار** / yaldar/: ئاوەڵناو. خاوەن یاڵ یان پۆپە ‹دیکێ یالدار› ☰ یالدار

**یالودووف** / yal û dûv/: ☜ **یاڵوبژ**

⊡ **یالودووف کرن**: برین و ڕێک کردنی تووکی کلک و یالی ئەسپ ☰ موی دُم و یال اسب را کوتاه کردن

**یالە** / yale/: ناو. کەلەشاخی جۆش کراو بۆ شەراو تێدا خواردنەوە ☰ ساغر از شاخ گاو

**یاڵ** / yał/: ناو. ١. پژ؛ بژ؛ بژی؛ بژوو؛ پژوو؛ ژەژی؛ دەهف؛ تیسکی سەر مل و سینگی بڕێ حەیوان (وەک: ئەسپ و شێر) ٢. شانی چیا ‹تاقە دارێ بووم بە سەر یالەوە/ عاجز بووم بە دەس بای شەمالەوە «فۆلکلۆر»› ٣. *[باوەری کۆن]* هاڵ؛ ئالە؛ جنۆکەی زەیستان کوژ ٤. پۆپەی کەلەشێر ☰ ١. یال ٢. ستیغ کوە ٣. آل ۴. تاج خروس

**یاڵانچی**[1] / yałançî/: ناو. مرواری دەسکرد و نائەسڵ؛ مرواری بەدەڵ ☰ مروارید بدلی

**یاڵانچی**[2]: ئاوەڵناو. فشەکەر؛ فڕبێژ؛ درۆزن ☰ دروغگو

**یاڵتەبەق** / yałtebeq/: ناو. یاڵتەبەک؛ سینی لە دار چێکری ☰ سینی چوبی

**یاڵتەبەک** / yałtebek/: ☜ **یاڵتەبەق**

**یاڵگەنیگ** / yałgenîg/: ئاوەڵناو. *[بەلار]* کەچەڵ ☰ کل؛ کچل

**یاڵلا** / yałla/: دوعا. ١. ها؛ دەی؛ وتەیەکە بۆ دنە دان ‹یاڵلا کوڕگەل بیگەنێ!› ٢. پێشەنگی دەرکردن ‹یاڵلا وە دەرکەوە لە ماڵم!› ٣. وتەی سپاس ‹ـ ها ئەم چایە بخۆ! ـ یاڵلا!› ٤. وشەی سەیر مان ‹یاڵلا ئەوە لۆ کوێ چووبووی؟› ٥. وتەی پێش لە بەر هەستان ‹یاڵلا فەرموو دانیشە!› ٦. وتەی بە خێر هێنان و مەرحەبا ‹یاڵلا یاخوا بەخێر بی!› ☰ ١. کلمەی تشجیع ٢. هِرّی ٣. کلمەی تشکر ۴. کلمەی تعجب ۵. کلمەی برخاستن پیش پای کسی ۶. کلمەی خیرمقدم و احوالپرسی

**یاڵوبژ** / yał û bij/: ناو. یالودووف: ١. مووی سەر ملی ئەسپ و شێر ٢. *[بەلار]* مووی سەری گرژ و تێکئاڵۆزاو ☰ ١. یال حیوان ٢. موی ژولیده

**یاڵە** / yałe/: ناو. ١. شان و ملەی کێو ٢. *[باوەری کۆن]* ئالە؛ جنۆکەی زەیستان کوژ ☰ ١. ستیغ کوە ٢. آل

**یاڵەویاڵ** / yałe w yał/: ناو. کاری گەڕان بە کێو و یاڵ و دەرە و شیودا ‹یالەویال چووم تا گەیشتم بە کانییەکە› ☰ کوە بە کوە

**یام** / yam/: ئامراز. یا؛ یان؛ ئان؛ نام ‹یام بارە تەشریف یا نەمۆ، یا دوورۆ پەرسە حاڵمۆ/ تەرسە هەناسەی کاڵمۆ، خۆ کافرستانی نیۆ «سەیدی»› ☰ یا

**یان**[1] / yan/: چاوگ. ١. دان؛ داین ٢. خەبەر دان لە نەهاتوو ☰ ١. دادن ٢. غیبگویی کردن

**یان**[2]: ناو. ١. کولاو؛ نەوگ؛ تەحت؛ لباد ٢. قسەی سەیر و سەمەرەی دەروێشانە ٣. جێگەی سانەوەی گشتی ⚑ ١. نمد ٢. شطحیات درویشان ٣. استراحتگاه

**یان**[3]: ئاوەڵناو. بە تاسە و تینگی دیدار ‹دلێ من یانە سێ جار یانە «لاوکی کوردی»› ⚑ مُشتاق دیدار

**یان**[4]: جێناو. ١. لکاوی خاوەنداریەتی بۆ سێهەم کەسی کۆ ‹دەستیان؛ پێیان› ٢. ناسەی سێهەم کەسی کۆ (فاعیلی) ‹بردمانیان؛ نایان؛ بردیان؛ وتیان› ٣. ناسەی سێهەم کەسی کۆ (بەرکاری) ‹خواردنیان› ⚑ ١. ـ شان ٢. ـ ند ٣. ـ شان

**یان**[5]: ئامراز. یا؛ یام؛ نا؛ ئان؛ نام ‹دەست بدن هەڤ هەمی، پێشکەتن ئەم هەمی/ دا بچن بۆ خەبات، یان مرن یان خەلات «جگەرخوێن»› ⚑ یا

**ـ یان**[6]: پاشگر. ـ گا؛ جێگا ‹گەرمیان› ⚑ ـ گاه

**یانجوز** / yancûz/: ناو. خۆش‌هەلکێشە؛ ناوی گیایەکە ⚑ گیاهی است

**یانداخ** / yandax/: ناو. درکەژاڵ؛ وشترخۆرە ⚑ خارشتر

**یاندوز** / yandûz/: ناو. گیایەکە لە تاڵوو دەچێ ⚑ گیاهی است

**یانزدە** / yanzde/: ☜ یازدە

**یانزدمین** / yanzdemîn/: ☜ یازدەهەمین

**یانزدەهەمین** / yanzdehemîn/: ☜ یازدەهەمین

**یانزدهی** / yanzd(i)hî/: ☜ یازدەهەم

**یانزە** / yanze/: ☜ یازدە

**یانزمین** / yanzemîn/: ☜ یازدەهەمین

**یانزەهەم** / yanzehem/: ☜ یازدەهەم

**یانزەهەمین** / yanzehemîn/: ☜ یازدەهەمین

**یانش** / yan(i)ş/: ناو. هەڵە؛ سەهو ⚑ سهو؛ اشتباه

**یانکە** / yanke/: ناو. بیانک؛ بیانوو؛ بەهانە ⚑ بهانه

**یانگزە** / yangze/: ☜ یازدە

**یانگزەهەمین** / yangzehemîn/: ☜ یازدەهەمین

**یانگە** / yange/: ناو. ١. یانە؛ جێگەی سانەوە ٢. کێڵگە؛ مووچە و مەزرا ⚑ ١. باشگاه ٢. کشتزار

**یانە**[1] / yane/: ناو. ١. ماڵ؛ خانوو ‹شەو پاسەوانی یانەی لەیل مەکەرد/ ڕۆ چەنی شوان مەگێلا نە هەرد «سەیدی»› ٢. گاستین؛ یانگە؛ سانگە؛ جێگەی سانەوە ٣. ناوەڕاستی ئاپۆرە ٤. ئامرازێکە لە عەڕابەدا ⚑ ١. خانه ٢. کمپ ٣. وسط انبوه جمعیت ۴. وسیله‌ای در اراده

▣ **یانە وتن**: لە داهاتوو گوتن ‹ئەو کابرایە یانەیان دەبێژێ› ⚑ پیشگویی کردن

**یانە**[2]: ئاوەڵکار. دەنا؛ ئەگینا ⚑ وگرنه

**یانە**[3]: جێناو. ئەوانە؛ وان؛ ئەوان ‹ئەرێ یانە کێن؟› ⚑ آنها

**یانەوان** / yanewan/: ناو. /کنایە/ خاوەن‌ماڵ (بریتی لە باوک) ⚑ سرپرست خانواده

**یانی**[1] / yanî/: ناو. ١. خانوو؛ ماڵ ٢. یانە؛ جێگەی سانەوە ⚑ ١. خانه ٢. باشگاه

**یانی**[2]: ئاوەڵناو. نهێنی؛ وەشارتی ⚑ نهانی

**یانی**[3]: ☜ یانێ

**یانی‌گر** / yanîgir/: ئاوەڵناو. نهێنگر؛ تایبەتمەندی سەگێ کە لەپڕ و بێدەنگ خەڵک بگرێ ⚑ ویژگی سگی که بدون پارس کردن گاز می‌گیرد

**یانیها** / yanîha/: ئاوەڵکار. واتا؛ یانێها؛ مانای وایە ⚑ یعنی که

**یانێ**[1] / yanê/: ئاوەڵکار. یانی؛ یەعنی: ١. /گفتاری/ ئایا؛ ئاخۆ ‹یانێ ئەبێ ڕۆژێک ئێمەش دەوڵەمەند بین؟› ٢. لە ڕاستیدا ‹ئەمن زوو ڕۆیشتم، یانێ من زوو نەڕۆیشتم، باقی دێر هاتن› ⚑ ١و٢. یعنی

**یانێ**[2]: ئامراز. یانی؛ یەعنی: ١. واتا؛ واتە؛ یانێها ‹یەزدان یانێ خوا› ٢. یانێها؛ یانێهای ‹چەند شتێکی تووکاند، کەسی تێ نەگەیشت، یانێ منیش

زمانی بیانی دەزانم!› ۱و۲. یعنی

**یاو**[1] / yaw/: ناو. ۱. تا؛ تەو ‹ئەز ئاشک بێنێ، بە یـاو و ئەشـکێ/ گرینـێ و سـۆچنێم مـن یـاو و ئەشـکێ «سەیدی»› ۲. گڕ و تینی تا و لەرز ۳. ئاو ٤. یاد؛ بیرەوەری ٥. ئەسپ ٦. یەک؛ ژمارەی پێش دوو ۱. تب ۲. گرمای تب ۳. آب ۴. یاد ۵. اسب ۶ عدد یک

⊡ **یـاو بـڕین**: دۆعـای لاچـوونی یـاو نووسـین دُعای تب‌بر نوشتن

**یـاو**[2]: ئاوەڵناو. ۱. ئەسـپایی؛ هێـواش ۲. هاوتـا؛ بەرانبەر ۱. آهسته ۲. مساوی

**یاوان**[1] / yawan/: چاوگ. گەیشـتن وارد شـدن؛ رسیدن

**یاوان**[2]: ☜ **بیابان**

**یاوای** / yaway/: چاوگ. گەیشتن؛ هاتنـە بـەرەوە ‹سا مایەی عومرم یاوان وە سالێ/ دڵ بـین پێکیـای سۆسەنین خالێ «پەشێو گۆرانی»› رسیدن

**یاوایرە** / yawayre/: چاوگ. ڕاخسـتن؛ داخسـتن گستردن؛ پهن کردن

**یاوبڕ** / yawbiř/: نـاو. ۱. کەسـێ کـە نۆبـەتێ بـۆ خەڵک دەبـڕێ ۲. دەزووی نۆبـەتێ بـڕین ۱. دعانویس برای قطع تب ۲. نخ تب‌بُری

**یاوبو** / yawbû/: ناو. بیرەوەری یادبود

**یاوتا** / yawta/: ناو. یاوتاو؛ لەرز و تا تب و لرز

**یاوتاو** / yawtaw/: ☜ **یاوتا**

**یاودار** / yawdar/: ئاوەڵناو. تەدار تب‌دار

**یاودی** / yawdî/: ☜ **یەهوودی**

**یاوس** / yawis/: ☜ **ناوس**

**یاوکردگ** / yawkirdig/: ئاوەڵناو. تـادار؛ نۆبـەتی‌دار تبدار

**یاوکوژە** / yawkuje/: ناو. گەنەـ گەنە؛ دەرمانەلەرز؛ قەنەقینە گنه_گنه

**یا و لەرز** / ya w lerz/: ناو. تا و لەرز؛ لەرز و تا تب و لرز

**یـاومز** / yawmiz/: نـاو. یاونشـان؛ خشـرۆک؛ تمیسک؛ تێمیسک؛ ئێمشک؛ کەرمشک؛ زیپکەی ویرووسی دەوری دەم و لێو کە بە هۆی نەخۆشی (بەتایبەت یاو) یان ڕاچڵەکینەوە سەر هەڵـدەدا تبخال

**یاونای** / yawnay/: چـاوگ. گهاندن؛ گەیانـدن رساندن

**یاونشان** / yawn(i)şan/: ☜ **یاومز**

**یاونیشان** / yawnîşan/: ناو. تامیسـک؛ تێمیسـک تبخال

**یاوە**[1] / yawe/: ناو. وڕاوە؛ وڕێنە؛ هاتەران هذیان

**یاوە**[2]: ئاوەڵکار. سەبرۆکە؛ ئەسپایی آهسته

**یـاوەر**[1] / yawer/: نـاو. بریکـاری؛ جێگرایـەتی معاونت

**یاوەر**[2]: ئاوەڵناو. یاریدەر؛ یاریدە؛ یاریدەدەر؛ ئاریکار؛ هاریکار؛ یارمەتیدەر ‹سەری جـەنگی هەیـە دایـیم لەگەڵ من چەرخێ دوون‌پەروەر/ نە بـەختم یـار، نـە چەرخم یاوەر و نە تـالحم ڕەهبـەر «شـێخ ڕەزا»› یاور

**یاوەرە** / yawere/: ناو. ۱. منالدان ۲. ئاوالمنـداڵ ۱. رحم ۲. جفت نوزاد

**یاوەنـان** / yawenan/: چـاوگ. گەیانـدن؛ پێ‌گەیاندن رساندن

**یاوەیاو** / yaweyaw/: ئاوەڵکار. سـەبرە ــ سـەبرە؛ هێدی ـهێدی ‹من ئەچم، ئێوەیش یاوەیـاو بـێن!› آهسته ـ آهسته

**یاویایرە** / yawyayre/: چـاوگ. ڕاخران؛ داخریـان گُستردن؛ پهن شدن

**یاهۆ**[1] / yaho/: جێناو. وا؛ ئـاوا؛ ئاوەهـا ‹یـاهۆ کـر و دەی نەکر «مەسەل»› چنین

**یاهۆ**[2]: ئامراز. وشەی سەیر مان حرف تعجب

**یاهو**[1] / yahû/: ناو. جۆرێ کۆتر نوعی کبوتر

**یاهو**[٢]: نزا. وتەی سەرزاری دەروێشان ☰ یاهو؛ تکیەکلام درویش

**یاهو**[٣]: دەنگ. هۆ؛ هۆی ☰ آهای

**یاهی / yahî/**: ناو. ١. ئاکام؛ ئەنجام ٢. دوایی؛ کۆتایی ☰ ١. نتیجه ٢. پایان

**یای / yay/**: ناو. ١. یا؛ یایە؛ وشەی ڕێز گرتن بۆ ژنی بەڕێز ‹یای مروەت› ٢. بیر؛ یاد ٣. دوگمەی وە کار خستنی مەکینە و ئەسپاب ٤. داک؛ دالک؛ دایک ٥. پوور؛ خالتیک؛ خوشکی دایک ☰ ١. خانم ٢. یاد ٣. دکمەی استارت ۴. مادر ۵. خاله

**یایک / yay(i)k/**: ناو. ١. داک؛ دالک؛ دایک ٢. خالتێک؛ پوور؛ خوشکی دایک ☰ ١. مادر ٢. خاله

**یایکزا / yay(i)kza/**: ناو. پوورزای دایکی؛ ڕۆڵەی خوشکی دایک ☰ خالەزاده

**یایە / yaye/**: ناو. ١. یای؛ یا؛ ژنی بەڕێز ‹کەوتمە نێو چالی دیلی وەک مەمێ/ یایە زین لە کوێیە هاواری کەمێ «هێمن»› ٢. دایە؛ دایک ‹گەر من درۆ دەکەم ئەوە دایکت بپرسە لێی/ یایە بە دەستی خۆی کفن و دفنی کردووە «شێخ ڕەزا»› ☰ ١. خانم ٢. مادر

**یایی / yayî/**: ئاوەڵناو. بە دوگمە بۆ وە کار خستن ☰ دارای دکمەی استارت

**یخ / yix/**: دەنگەناو. ١. وشەی ئاژۆتنی بزن ٢. وتەی بە سەر چۆکا هێنانی وشتر ☰ ١. حرف راندن بُز ٢. حرف خواباندن شتر

▣ **یخ دان**: بە سەر چۆکا هێنانی وشتر ☰ خوابانیدن شتر

**یخخە / yixxe/**: دەنگ. ییخە؛ ئیخە؛ وتەی ئاژۆتنی بزن ☰ صدای راندن بز

**یل / yil/**: ناو. عێل و عاشیرەت ☰ ایل؛ طایفه

**یود / yud/**: ناو. توخمی کیمیایی ناکانزا لە دەستەی هالۆژن بە ژمارەی ئەتومی ٥٣ و کێشی ئەتومی ١٢٦,٩٠ بلۆرێکی قاوەیی تۆخە کە هەڵمی بنەوشی لێ‌دەبێتەوە و زۆر ژەهراوییە، لە وێنەگری، دەواسازی و زۆر کاری‌تری پیشەسازیدا بە کەڵک دێ ☰ یُد

**یورت / yurt/**: ناو. جێ لەوەڕ؛ لەوەڕگە؛ چایەر ☰ چراگاه

**یوژنە / yujne/**: ناو. یۆژە؛ قایشی جووت ☰ تسمەی رابط یوغ و خیش

**یوسر / yusr/**: ناو. ویسر؛ بەری دارێکە ڕەنگی ڕەشە، تەزبێحی لێ چێ دەکەن ☰ یُسر؛ دانەی تسبیحی

**یوڤ / yuv/**: ناو/ ئاوەڵناو. یەک ☰ یک

**یوک / yuk/**: ناو. دۆلاب ☰ کمد بزرگ

▣ **یوکا جللان**: دۆلابی جلکان ☰ کمد بزرگ لباس

**یوم / yum/**: ☜ **یومن**

**یومن / yumn/**: ناو. ودم؛ یوم؛ ممبارەکی ‹ئاخری هەر بە یومنی لوتفی خودا/ دێنە ژێر سایەیی هومایی وەتەن «بێخود»› ☰ شگون؛ یُمن

**یونجە / yunce/**: ناو. هارێە؛ کەلووەسمە؛ کرمێکی سەوزی مێملی نۆکە ☰ کرم آفت نخود

**یونیفۆرم / yunîform/**: ناو. فۆرم؛ فرم؛ جلکی فەرمی یەکدەست ☰ لباسِ فُرم

**یوە / y(i)we/**: جێناو. ئێکێک؛ یەکێک (بۆ مێ) ☰ یکی

**یوە / yuh/**: ناو. هوها؛ هەرا؛ دەنگی بەرز ☰ هو؛ فریاد نارضایتی

▣ **یوە کەردش**: هوها کردن؛ بە کۆمەڵ هەرا کردن و بێزاری لە کەسێ دەربڕین ☰ هَو کردن

**یۆ / yo/**: جێناو. یوو؛ یەکێ؛ یەکێک (بۆ نێر) ☰ یک؛ کسی

**یۆبینو / yobînû/**: ☜ **یۆنا**

▣ **یۆبینو مومژنایش**: یەوبینان دیاییش؛ یەونا

ڤینابیش؛ یەکتر چاو پێکەوتن ☰ یکدیگر را دیدن

**یۆخرۆکە** / yox(i)roke/: ئاوەڵکار. مەگین نا ☰ مگر نه

**یۆخلەمە** / yoxleme/: ناو. کاری لە دوو گەڕان؛ بۆ کەسێ/ شتێ گەڕان ☰ عمل دنبال کسی/ چیزی گشتن

**یۆخە** / yoxe/: ناو. یەوخە؛ ناسکە نان؛ نانی تەنک ☰ نان نازک

**یۆرت** / yort/: ناو. قالب؛ بەدەن ☰ کالبد

**یۆرش** / yoriş/: ناو. شالاو؛ هێرش؛ پەلامار ☰ یورش

**یۆرغە** / yorğe/: ناو. وێرغە؛ جۆرێ ڕەوتی یەکسم ☰ یورغه

**یۆز** / yoz/: ناو. هاس؛ تووڵە پڵنگ ☰ یوزپلنگ

**یۆزتەیەوە** / yozteyewe/: ☜ یۆستەیەوە

**یۆزیایەوە** / yozyayewe/: چاوگ. دۆزرانەوە؛ دۆزیانەوە ☰ پیدا شدن

**یۆژە** / yoje/: ☜ یوژنه

**یۆستەیەوە** / yosteyewe/: چاوگ. یۆزتەیەوە؛ دۆزینەوە ☰ بازیافتن

**یۆم** / yom/: ناو. ١. ئۆغر؛ ودم؛ ممبارەکی ٢. ڕێگە؛ مزڵێ کە بۆی دەچی ‹یۆمێ تە ب خێر›. ☰ ١. مبارکی؛ یُمن ٢. مقصد سفر

**یۆمە** / yome/: ☜ یەومیە

**یۆنا** / yona/: جێناو. یۆبینوو؛ یەمنۆ؛ یەوبنا؛ یەوبینان؛ یەونا؛ یەونۆ؛ یەکتری ☰ یکدیگر

**یۆنجە** / yonce/: ناو. یۆنجێ؛ وێنجە ☰ یونجه

**یۆنجێ** / yoncê/: ☜ یۆنجە

**یۆنیوم** / yonyum/: ناو. ئیزۆتۆپی تیشکدەری سروشتی توخمی توریوم بە جرمی ئەتومی ٢٣٠ ☰ یونیوم

**یوو** / yû/: ☜ یۆ

**یوونی** / yûnî/: جێناو. ئەمان؛ ئەمانە ☰ این‌ها

**یە**[1] / ye/: ناو. یەک؛ ئێک ☰ یک

**یە**[2]: جێناو. ئینە؛ ئەمە ‹ڕوولەکەی پای سەنگەرم!/ یە چە بی هاتییە سەرم؟ «فولکلۆر»› ☰ این

- **یە**[3]: کردار. پێکهاتەی سێهەم کەسی تاکی چاوگی بوون ‹برایە؛ وایە؛ سەریە› ☰ است

• **یە**[4]: پاشەوشە. ئەی (بۆ نزا) ‹خودایە خۆت فریام کەوە!› ☰ ای

**یەباش** / yebaş/: ☜ یەواش

**یەباشکی** / yebaşkî/: ☜ یەواشکی

**یەپارچە** / yeparçe/: ☜ یەکپارچە

**یەپراخ** / yeprax/: ☜ یاپراخ

**یەتاخ** / yetax/: ☜ یاتاخ

- **یەتی** / -yetî/: پاشگر. ـ یتی: ١. لە ناو یا ئاوەڵناو ناوی چاوگ دروست دەکا ‹برایەتی؛ ئازایەتی› ٢. نیشانەی هاوگەری ‹ژنیەتی؛ مەردایەتی› ٣. نیشاندەری چۆنیەتی حاڵ و بارودۆخ ‹ماندوویەتی؛ سەگیەتی› ☰ ١. اسم مصدر ساز ٢و٣. ـ گی

**یەتیم** / yetîm/: ☜ هەتیو

**یەتیمچە** / yetîmçe/: ☜ هەتیمچە

**یەتیمچەرک** / yetîmçerik/: ☜ هەتیمچە

**یەجگار** / yecgar/: ئاوەڵکار. هێجگار؛ یەکجار؛ فرە؛ زۆر ‹یەجگار برسیمە› ☰ بسیار

**یەچک** / yeçik/: ناو. هێچک ☰ وهنگ

**یەح** / yeĥ/: دەنگ. ١. وتەی سەیر مان ٢. دەنگی بانگ کردنی بزن بۆ گەڕانەوە ☰ ١. وه؛ حرف تعجب ٢. کلمه‌ی فراخواندن بُز

**یەحگدۆ** / yeĥg(i)do/: ☜ یەحیەح

**یەحیابەگی** / yeĥyabegî/: ناو. جۆرێ هەنجیر ☰ نوعی انجیر

**یەحیەح** / yeĥyeĥ/: دەنگ. یەحگدۆ؛ یێخە؛ وشەی دنە دانی بزن بۆ دوور کەوتن ☰ کلمه‌ی

ڕاندن بُز

**یەخ / yex/**: ناو. سەهۆڵ؛ سۆڵ؛ جەمەد ‹جۆی چەمەی شەوقم هەم یەخ کەردەوە/ مەزرەعەی هەستیم شەڵتە بەردەوە «مەولەوی»› 🇮🇷 یخ

◘ **یەخ بەستن** بوونە سەهۆڵ؛ گرسانی ئاو 🇮🇷 یخ بستن

**یەخ کردن** ١. کەسیرە بوون لە سەرمان ٢. [کینایە] دامان؛ کەوتنە تەنگانەوە؛ پەک کەوتن ‹بەخ مەکە! یەخ ئەکەی! «مەسەل»› 🇮🇷 ١. یخ کردن ٢. درماندن

**یەخانگیر / yexangîr/**: ئاوەڵناو. دەستەویەخە؛ دەستەویەخە ‹قسەیان تێک گیرا و یەخانگیر بوون› 🇮🇷 دستبەیقە

**یەخاو / yexaw/**: ناو. سەهۆڵاو؛ ئەو ئاوە لە توانەوەی یەخ دروست دەبێ و وردە و لەتی یەخیشی تێدایە 🇮🇷 آب یخ

**یەخبەنان / yexbenan/**: ☜ یەخبەندان

**یەخبەند / yexbend/**: ئاوەڵناو. ڕچیاگ؛ سەهۆڵبەستوو ‹مزانی بدۆ زومستان ویەرد/ تەختی یەخبەندش هەوا دا بە گەرد «سەیدی»› 🇮🇷 یخبستە

**یەخبەندان / yexbendan/**: ناو. یەخبەنان؛ بەستەڵەک؛ شەختە؛ سەهۆڵبەندان 🇮🇷 یخبندان

**یەخترمە / yextirme/**: ناو. یەختەرمە: ١. ئەسپ و ماینی تالانی ٢. یەدەکی؛ ئەسپێ کە بۆ نۆرە پێ کردن دەگەڵ سواردایە ٣. ئەسپی زین و لغاو کراوی بێ‌سوار کە لە ئازیەتباریدا ڕایدەکێشن 🇮🇷 ١. اسب غنیمتی ٢. اسب یدک ٣. اسب بدون سوار در مراسم عزاداری

**یەختە[1] / yexte/**: ناو. ١. داری سەرقرتاو ٢. ئەسپ و ماینی سواری ‹شاڵ و قاشاو بۆ یەختەی ڕەش/ دیزەی لە سەر ئاگری گەش «پیرەمێرد»› 🇮🇷 ١. درخت سر قیچی شدە ٢. اسب سواری

**یەختە[2]**: ئاوەڵناو. خەساو؛ خەسیاگ؛ ئێختە؛ گون‌دەرهاتوو 🇮🇷 اختە

**یەختەخان / yextexan/**: ☜ یەختەرخانە

**یەختەخانە / yextexane/**: ☜ یەختەرخانە

**یەختەرخانە / yexterxane/**: ناو. یەختەخان؛ یەختەخانە؛ تەویلەی ئەسپان 🇮🇷 اصطبل اسبان

**یەختەرمە / yexterme/**: ☜ یەخترمە

**یەختەسار / yextesar/**: ناو. ئاهۆ؛ ئازار 🇮🇷 آفت

**یەخچاڵ / yexçał/**: ☜ یەخەچاڵ

**یەخدان / yexdan/**: ناو. ١. ☜ یەغان ٢. قوتوولکەی ڕۆن ٣. جێ یەخ 🇮🇷 ١. ☜ یەغان ٢. روغندان کوچک ٣. یخدان

**یەخدو / yexdû/**: ☜ یەغان

**یەخسیر / yexsîr/**: ئاوەڵناو. یەسیر: ١. دیل؛ گراو لە شەڕدا ٢. بێچارە؛ بەستەزمان 🇮🇷 ١. اسیر ٢. بینوا

**یەخسیری / yexsîrî/**: ناو. دیلی؛ دیلیەتی 🇮🇷 اسارت

**یەخنی / yexnî/**: ناو. یەغنی: ١. تاسی قووڵ بۆ شێو تێ کردن ٢. کەماو؛ چێشتی گۆشتاوی چەور و خەستوخۆڵ 🇮🇷 ١. نوعی کاسەی آشخوری ٢. آبگوشت

**یەخنیکێش / yexnîkêş/**: ناو. یەغنی‌کێش؛ تاسی مسینی گەورە 🇮🇷 کاسەی مسین بزرگ

**یەخە / yexe/**: ناو. یاخە؛ یاقە؛ یەقە؛ ئیخە؛ ئێخە؛ پێسیر؛ ئەو بەشە لە جلوبەرگ کە دەوری مل و سەر سینە دەگرێ ‹یەخەی کراسی لاچوو، پشکووت بە هەردوو لێوان/ گوڵ و شەکەر دەباری لە کووچەباغی سێوان «وەفایی»› 🇮🇷 یقە

◘ **یەخە بەر نەدان** [کینایە] لە کۆڵ نەبوونەوە 🇮🇷 دست بردار نبودن

**یەخە (پێ) گرتن** [کینایە] کێشە تێ هاڵاندن ‹فرۆفێلیش هەر یەخەی خاوەنی دەگرێ «هەژار، قورئان»› 🇮🇷 در هچل انداختن

**یەخە دادڕان** شین و ڕۆ ڕۆ کردن ‹پەشۆکا دل کە دی زولفی پەشێوی کەوتە سەر شانی/ یەخەی

خۆی دادڕی گوڵ هەر کە دی چاکی گریبانی «ئەحمەد موختار جاف»» ☰ ماتم گرفتن

**یەخە (لێ) دادڕین** ١. *[کینایە]* چاو (لێ) پۆشین و نەویستن ٢. بە نیشانەی ماتەم و شین یەخەی جل‌وبەرگ دڕین ‹هەر لە کوێستانەوە هەتا گەرمێن/ یەخەمان دادڕیوە تا دامێن «هێمن»› ☰ ١. از خیر چیزی گذشتن ٢. سینه چاک کردن

**یەخەچاك / yexeçak**/: ئاوەڵناو. دڵسووتاو؛ جەرگ‌بڕاو ‹یەکەم نەورۆزە دەرچووە لە خاک/ لە عەشقی یاران شێت و یەخەچاک «پیرەمێرد»› ☰ سینەچاک

**یەخەچاڵ / yexeçał**/: ناو. یەخچاڵ؛ سەهۆڵدان؛ سەهۆڵان: ١. ساردینگ؛ دەزگایەکی کارەبایی وێنەی کومێد، سندووق یان هۆدە بۆ سارد کردنەوە و بەرگری لە گەنینی خواردەمەنی ٢. بەفرەچاڵ؛ ئەو قووڵکە لە چیا بەفری تێ دەکەن و دایدەپۆشن بۆ هاوین ☰ ١. یخچال ٢. برفچال

**یەخەدادڕاو / yexedad(i)řaw**/: ناو. جۆرێ گەنم ☰ نوعی گندم

**یەخەدڕ / yexedir̄**/: ناو. دەمی کارێز ☰ دهانەی قنات

**یەخەکێشیاگ / yexekêşyag**/: ناو. *[مەجاز]* زڕمناڵ ☰ فرزندخوانده

**یەدەك / yedek**/: ناو. یەدەکی: ١. ئەردەک؛ ئێردەک؛ ئێدەک؛ منیەک؛ یەختەرمە؛ یەخترمە؛ یەدەگ؛ ئەسپێ کە بۆ نۆرە پێ کردن دەگەڵ سواردایە ٢. سپێر؛ پێتەک ☰ ١. اسب یدک ٢. قطعات یدکی

**یەدەکی / yedekî**/: ☜ **یەدەك**

**یەر / yer**/: ناو. ١. جێگە؛ جێ ٢. ئێوارە؛ ئێوار؛ یەرە ☰ ١. جا؛ مکان ٢. تنگ غروب

**یەربەیەر / yerbeyer**/: ئاوەڵناو. یەرەویەر؛ جێبەجێ؛ بەڕێوەچوو ☰ انجام‌شده

▣ **یەربەیەر بوون** جێبەجێ بوون ‹کارەکە یەربەیەر بوو› ☰ انجام شدن

**یەرتکی / yert(i)kî**/: ئاوەڵناو. شێتۆکە؛ دینۆ؛ کەم‌ئاوەز ☰ خُل‌مزاج

**یەرخات / yerxat**/: ناو. پاڵە؛ کرێکار؛ ڕەنجبەر؛ ڕەنجدەر؛ خەباتکار؛ خەباتچی ☰ کارگر

**یەرخرمە / yerxirme**/: ناو. باقە ☰ بستەی گیاه

**یەرد / yerd**/: ☜ **یارد**

**یەردە**[1] **/ yerde**/: چاوگ. هاڕین؛ کردنە ئارد ☰ آرد کردن

**یەردە**[2]: ناو. پێوەرێکی درێژاییە بۆ پێوانی قوماش ‹کۆتاڵ و چایی و شەکر بە فەردە/ ئەمفرۆشت بە خەڵک بە هۆقە و یەردە «قانع»› ☰ واحدی طولی

**یەرکەن / yerken**/: ناو. بادەوەی گەمیە ☰ بادبان کشتی

**یەرمە / yerme**/: ناو. لوڕ؛ کورتانۆکەی بە پووش ئاخندراو بۆ سەر پشتی بارەبەر لە بن جلەوە ☰ پالانک بالشتک مانند

**یەروم / yerum**/: ☜ **یەرەم**

**یەرە / yere**/: ناو. ١. سێ؛ دوو و یەک ٢. ئێوارە ☰ ١. سه ٢. غروب

▣ **یەرەوو تەنگ** تەنگی ئێوارە؛ هەرەتگای تەنگ؛ تەنگی بانگی شێوان ☰ تنگ غروب

**یەرەتلاقە / yeret(i)łaqe**/: ناو. *[شەرع]* سێ‌تەلاقە؛ سێ‌بەسێ؛ کاری خستنی تەواوی تەلاقان کە ئیتر گرێ نەخواتەوە ☰ سەطلاقه

**یەرەژن / yerejin**/: ناو. ١. ئەژنۆ؛ زرانی ٢. ئانیشک؛ هەنیشک ☰ ١. زانو ٢. آرنج

**یەرەق**[1] **/ yereq**/: ناو. ١. تۆپی ئاش ٢. ئاموور؛ ئەسپابی جووت ٣. *[شوورەیی]* کێری یەکسم ٤. *[مەجاز، شوورەیی]* کێری ڕەپ ☰ ١. پروانەی آسیاب

٢. خیش ٣. آلت تناسلی ستور و الاغ ٤. آلـت تناسـلی برخواسته

**یەرەق**[٢]: ئاوەڵناو. *[شووروەیی]* هەستاو (کێـر) ☰ نعـوظ کرده

◻ **یەرەق بـوون:** *[شووروەیی]* ڕەپ بـوونی ئەنـدامی نێرینه ☰ برخواستن آلت تناسلی

**یەرەق کردن:** *[شووروەیی]* ئیرەق کـردن ☰ راسـت کردن آلت تناسلی

**یـەرەقان** / yereqan/: نـاو. زەردەیـــی؛ زەردی؛ نەخۆشییەکی گیرۆیه پێسـت و کـاژ و سـپێنەی چاو به هۆی زۆر بوونی زەرداو لـه خوێنـدا، زەرد دادەگەڕێن ☰ یرقان

**یەرەقه** / yereqe/: ناو. هەوجار؛ ئاموور ☰ خیش

**یەرەڵماسی** / yerełmasî/: ناو. یارەڵماسی؛ پەتاتـه؛ سێفـزەمینی ☰ سیبزمینی

**یەرەم** / yerem/: ئاوەڵـناو. یەروم؛ سێهەم؛ سـێیەم ☰ سوم

**یەرەوەیەر**[١] / yerweyer/: ☜ **یەربەیەر**

**یەرەوەیەر**[٢]: ئاوەڵناو. بەرانبەر؛ بەرامبەر ☰ برابر

**یەرەی** / yerey/: نـاو. یەره؛ ئێواره؛ ئێواره وەختە ☰ غروب

**یەری ـ یەری** / yerî yerî/: ☜ **یەرێ ـ یەرێ**

**یەرێ** / yerê/: ناو. سێ ☰ سه

**یەرێ ـ یەرێ**[١] / yerê yerê/: ناو. یەرییەری؛ کار و ڕەوتی پەله کردن ☰ شتاب

**یەرێ ـ یـەرێ**[٢]: ئاوەڵـکار. یـەرییـەری؛ پەلەپـەل؛ بەپەله؛ بلەز ‹ئەوە یەرێ ـ یەرێ چەتە؟ تاوێ سـەور کە! ئەچین› ☰ شتابان

**یەزدان** / yezdan/: نـاو. خودا؛ خوا؛ ئێـزد؛ خـودێ؛ هۆمان؛ بینایی چاوان؛ خودانی عالەمێ؛ باخوێ ☰ یزدان

**یـەزدانی** / yezdanî/: نـاو. خـودایی؛ خـوایی ☰ یزدانی

**یەزدۆ** / yezdo/: ئاوەڵناو. خوداپەرست؛ خواپەرەس ☰ خداپرست

**یەزدی** / yezdî/: ☜ **ئیزەدی**

**یەزنه** / yezne/: ناو. ١. مێردی خوشک ٢. جێژن؛ جەژن ☰ ١. شوهرخواهر ٢. جشن

**یەزەن** / yezen/: ناو. زاوا؛ شووی کچ یان خوشـک ☰ داماد

**یەزی** / yezî/: ئاوەڵناو. بـەس؛ بەسـنه؛ بەسـنده ☰ کافی؛ بس

**یەزیدی** / yezîdî/: ☜ **ئیزەدی**

**یەساغ** / yesağ/: ناو. یاسا؛ قانوون ☰ قانون

**یەساوڵ** / yesawił/: نـاو. یاسـاوڵ؛ کێشـکچی؛ نگابان ‹هەتا لێیان وە ژوور کەوتن یەساول/ له خەودا سواری سینگیان بوون نەخافڵ «هێمن»› ☰ **یساول**

**یەستر** / yestir/: ☜ **هێسر**

**یەسقان** / yesqan/: ☜ **ئێسك**

**یەسک** / yesk/: نـاو. ئێسـک؛ سـوقان؛ پێشـه ‹لـه یەسکی ڕزیو وەرناگیرێ کاو/ بێ کاو دژواره ژینی ژن و پیاو «هێمن»› ☰ استخوان

**یەسه** / yese/: ناو. بست؛ بنگوست ☰ وجب

**یەسیر** / yesîr/: نـاو. ١. ☜ **یەخسـیر** ٢. سـێوی؛ منداڵی دایکمردوو ☰ ١. ☜ **یەخسیر** ٢. بچـەی مادرمرده

**یەش** / yeş/: ☜ **ئێش**

**یەشان** / yeşan/: ☜ **ئێشان**

**یەشم** / yeşm/: نـاو. شـــەوە؛ شـــەوەی ســـەوز؛ بەردێکی گرانبایی کەسکی تۆخه کـه زۆر ڕەق و تۆکمەیه ☰ یَشم

**یەشماخ** / yeşmax/: ☜ **یاشماخ**

**یەشو** / yeşû/: ☜ **هێشو**

**یـەع** / ye'/: دەنـگ. ئێـع؛ وتـەی بێـز کـردن؛ قیزەوشێویان؛ قێز لێبوونەوە ‹یەع چەنـد پـیس و بۆگەنه!› ☰ حرف اشمئزاز

**یەعنی / ye'nî/:** ☜ **یانێ**

**یەغان / yeğan/:** ناو. یەخدان؛ یەخدوو؛ یەغدان؛ سندووقی دارینی زەلام، بەتایبەت بۆ جل‌وبەرگ ⇆ صندوق بزرگ چوبی

**یەغدان / yeğdan/:** ☜ **یەغان**

**یەغز / yeğz/:** ناو. ڕەنگێکە زۆرتر لە ولاخی سواری و باریدا بەدی دەکرێ ⇆ از رنگ‌های استر

**یەغما / yeğma/:** ناو. تالان ‹دەوری هەر چاوێکی ئەمڕۆ داوە سەد فەوجی بەلا/ دین و دل یەغما دەکەن، چاری کەن ئەی شێخ و مەلا! «مەحوی»› ⇆ یغما

**یەغماگەر / yeğmager/:** ناوەڵناو. تالانچی ‹مەجنوونی جیلوەی ئەو پەرییەم دیوە، هەرچی دی/ یەغماگەرێکە عەقلی لە پیر و جەوان دزی! «مەحوی»› ⇆ یغماگر

**یەغنە / yeğne/:** ☜ **یەغنی ـ٢**

**یەغنی / yeğnî/:** ناو. ١. ☜ **یەخنی** ٢. یەغنە؛ گیشەی گیا یان گەنم و جۆی درواو ⇆ ١. ☜ **یەخنی** ٢. تودەی علوفە یا گندم و جو درو شدە

**یەغنیکێش / yeğnîkêş/:** ☜ **یەخنیکێش**

**یەغ یەغ / yeğyeğ/:** دەنگەناو. وتەی دنە دانی بزن بۆ خۆشڕۆیی ⇆ کلمەی راندن بُز

**یەفش / yefş/:** ناو. پشوو؛ وچان لە کار ⇆ استراحت

**یەڤا / yeva/:** ناوەڵکار. هەمیشە؛ دایم‌ودەرهەم ⇆ همیشه

**یەڤە / yeve/:** ناو. کات؛ وەخت ⇆ هنگام

**یەڤەن / yeven/:** ناوەڵناو. جوان؛ دەلال ⇆ زیبا

**یەق / yeq/:** ناو. ١. قرپ؛ قورپ؛ قورقێنە ٢. قەی؛ دۆخی ڕشانەوە ٣. پەنگ؛ ڕەوتی گەڕانەوەی تراو لە جێگەی خۆی ⇆ ١. آروغ ٢. استفراغ ٣. برگشت مایع راکد

⊡ **یەق خواردنەوە** پەنگ خواردنەوە؛ گەڕانەوەی ئاوی ڕاوەستاو ‹ئاوەکە یەقی خواردۆتەوە لە بەری ناڕوا› ⇆ راکد ماندن و برگشتن آب

**یەق کردنەوە** ١. وەڕشان؛ ڕشانەوە؛ هێنانەوە؛ هەڵهاوردنەوە ٢. نم کێشان (شتی وەک خوێ و شەکر) ⇆ ١. قی کردن ٢. نم کشیدن (نمک و شکر و...)

**یەقە / yeqe/:** ☜ **یەخە**

**یەقیر / yeqîr/:** ناوەڵناو. گیرۆدە؛ گیرخواردوو ⇆ گرفتار

**یەقین / yeqîn/:** ناو. دڵنیایی: ١. دڵڕاحەتی؛ ئەرخەیانی ٢. باوەڕی پتەو ⇆ ١. اطمینان ٢. یقین

**یەک[1] / yek/:** ناو. یێک؛ ئێک؛ ئیک؛ یاو؛ یەی؛ یە؛ یەو؛ ژمارەی سەرەکی لە زنجیرەژمارەی ئاسایی ⇆ یک

⊡ **یەک ل سەر یەک** ١. بە سەر یەکا هەڵچنراو ٢. بێ‌ماوە دان و دەرفەت ‹یەک ل سەر یەک داخاوت› ⇆ ١. بر روی هم انباشته ٢. پشت سر هم

**یەک لە دوای یەک** دانە ـ دانە بە شوێن یەکا ⇆ یکی پس از دیگری

**یەک[2]:** ناوەڵناو. ١. تاق؛ تاقانە؛ تاک؛ تاک و تەنیا؛ تەنیا و بێ‌هاوتا ‹یەک پیاو› ٢. یەکەم ‹ژمارەی یەک› ٣. بێ‌فەرق و جودایی ‹من و تۆ یەکین؛ ئەگەر ئێمە یەک بین کەس پێمان ناوەستێ› ٤. بێ‌کەم‌وکووڕی ‹لە جوانیدا یەکە› ⇆ ١تا٣. یک ٤. تک

⊡ **یەک بوون/ بووین/ بین** یەک گرتن ‹یەک بین چەقل چاو دوژمنین/ تەک بین هەر هەڵوای خواردنین «فولکلۆر»› ⇆ یکی شدن

**یەک خستن** ١. کردنە یەک ٢. لێک کردنە دژ ⇆ ١. مُتحد کردن ٢. دو بە هم زنی کردن

**یەک دان** لێک دان؛ تێکەڵ کردن ⇆ بە هم زدن

**یەک کرن** ١. کردنە یەک ٢. پێک‌هێنانی ئاپۆرە

لە سەر کاریٚ ≡ ١. یکی کردن ٢. بە توافق رساندن گروه

**یەک کەوتن/ کەتن/ کەفتن:** ١. وێک کەوتن؛ هاوکات بوون ‹ئەم دوو جەژنەمان کە وا یەک کەوتین/ ڕێی وێکەوتنە، خوا یەکی خستین «پیرەمێرد»› ٢. ڕێک کەوتن؛ یەک گرتن ‹هەر یەک کەوتن، سەرکەوتن!› ≡ ١. همزمان شدن ٢. مُتحد شدن

**یەک گرتن:** ١. یەک بوون ‹هەر بە یەک گرتن لە دەست بێگانە دێنینە دەریٚ/ خاکی پاکی کوردەواری، نایەڵین بۆ کەس ئەلەم «هێمن»› ٢. پێوە نووسان ‹بەو چرێشەوە یەکیان گرتووە› ≡ ١. متحد شدن ٢. به هم چسبیدن

**یەک گرتنەوە:** ١. یەک گرتن؛ یەکدڵ بوون ٢. پێک گەیشتن ≡ ١. مُتحد شدن ٢. به هم مُلحق شدن

**یەکەو نیان:** ١. کۆ کردنەوە ٢. لە سەر یەک دانان ≡ ١. گردآوری کردن ٢. بر هم گذاشتن

**هێنانە یەک:** هاوردنە یەک: ١. دوو لێوارەی شتێک لێک نزیک کردنەوە ‹گوتم ئایا بە زاری خۆت دەپرسی حاڵی زاری من؟/ بڕۆی هێنایە یەک، وەک شکڵی «لا» یەعنی کە بێزارم «نالی»› ٢. کۆتایی پێ هێنان ‹سەر و بنی قسەکەی هێنایە یەک› ≡ ١. به هم آوردن ٢. هم آوردن

**یەک[٣]:** جێناو. ١. یەکتر ‹دەست لە ئەستۆی یەک دەکەن، ئازاد و شاد و بەختەوەر/ کیژ و کوڕ، لاو و گراوی، دلبەر و دلداری کورد «هێمن»› ٢. یەکیٚ ‹یەک یاری دەویٚ لە بەزم و یاری/ یەک گیانی شرین دەدا بە یاری «هەژار، *مەم و زین*»› ≡ همدیگر

**یەک ـ[٤]:** پێشوشە. ١. خاوەن یەکیٚ ‹یەکچاو؛ یەکسم› ٢. تاق؛ بێ یەکی دی ‹یەکبەر؛ یەکبین؛ یەکلایەنە› ٣. خاوەن هاوچەشنی و یەک بوون ‹یەکسەر؛ یەکسان› ٤. بە تەواوی؛ ئەم پەڕ و ئەو پەڕ ‹یەکڕاست؛ یەکجار› ٥. پێکێ بە یەک؛ لەگەڵ چاوگدا دیٚ و نیشانەی دوو لایەنە بوونی کارەکەیە ‹یەک گرتنەوە؛ یەک‌نانەوە› ٦. سەر و تەواو؛ تاقانە و لە سەروو ‹یەکدان› ≡ ١تا۴. ـ یک ۵. (بە)هم ـ ۶. تک ـ

ـ **یەک[٥]:** پاشوشە. یەکدی ‹سەریەک› ≡ ـ هم

ـ **یەک[٦]:** پاشگر. یێک؛ بە دوای ناوەوە دیٚ و نیشانەی تاقانە بوونیەتی ‹بایەک؛ لایەک؛ ڕێیەک› ≡ ـ ی (وحدت)

**یەکا[١]** /yeka/: ئاوەڵناو. هەوەڵین؛ یەکەمین ‹مەستوورە، یەکا ژنی مێژوونووسی جیهان› ≡ اوّلین

**یەکا ـ[٢]:** پێشوشە. بە یەکدا ‹یەکایەک› ≡ بەهم

⊡ **یەکا دان:** تێکەڵ/ تێکەڵاو کردن ≡ بە هم آمیختن

**یەکاڵا** /yekała/: ئاوەڵناو. یەکالە؛ یەکلانە ≡ یک لایه

⊡ **یەکاڵا بوونەوە:** ١. لە ئاڵۆزی ڕزگار بوون؛ ڕەها بوونی تاڵی ئاڵۆز و تێکەڵاو ‹ئەم بەنە ئاڵۆزاوە و یەکالا نابێتەوە› ٢. [*مەجاز*] هەڵوەشانەوە؛ لە یەک بوونەوە ≡ ١. باز شدن و یک لایه شدن رشتەی درهم ٢. بر هم زدن

**یەکاڵا کردن/ کردنەوە:** ١. یەک لا کردنەوەی تێکەڵاو ٢. [*مەجاز*] تێک دان؛ هەڵوەشاندنەوە ≡ ١. یک لایه کردن ٢. بر هم زدن

**یەکاڵە** /yekałe/: ☜ **یەکاڵا**

**یەکان** /yekan/: ناو. تاکان؛ یەکەمین پلە لە ژمارەی ئاسایی ≡ یکان

**یەکاندەردوو** /yekanderdû/: ☜ **یەکدەردوو[٢]**

**یەکانگیر** /yekangîr/: ئاوەڵناو. یەکگرتوو؛ یەکدیگر ≡ مُتحد

⊡ **یەکانگیر بوون:** بە یەک گەیشتن و بوون بە یەک ‹بە جیا ڕۆیشتن، بەڵام دوو کووچە ئەولاتر

یەکانگیر بوون› 🇮🇷 مُتحد شدن؛ بە هەم مُلحق شدن

**یەکانگیری** / yekangîrî/: ناو. یەکگری؛ یەکیەتی؛ ڕەوتی بە یەک گەیشتن و بوون بە یەک ‹یەکانگیری و جودایی نێوان هێزەکانی ناوچە› 🇮🇷 اتحاد

**یەکانە**[1] / yekane/: ناو. بڕەک؛ بڕڕەک؛ نێرەبەراز 🇮🇷 گُراز نر

**یەکانە**[2]: ئاوەڵناو. تاقانە؛ بێهاوتا 🇮🇷 بی‌همتا

**یەکانەیەک** / yekaneyek/: ☜ یەکانایەک

**یەکانی** / yekanî/: ناو. تەنیایی؛ دۆخی تاک و تەنیا بوون 🇮🇷 تنهایی

**یەکاوە** / yekawe/: ناو. قوبڵی؛ قوبووڵی 🇮🇷 دمپُخت

**یەکاویەک**[1] / yekawyek/: ئاوەڵناو. دەسبەجێ ‹دوعای خەلیفە یەکاویەکە!› 🇮🇷 فوری

**یەکاویەک**[2]: ئاوەڵکار. دوو ئەوەندە ‹مامەڵەکە یەکاویەک قازانجی کرد› 🇮🇷 دوچندان

**یەکایەتی** / yekayetî/: ناو. تەنێتی؛ تاقانەیی؛ یەکایەتی؛ تەنیایی 🇮🇷 وحدانیّت

**یەکباد** / yekbad/: ئاوەڵناو. ١. تاکە جارێک بادراو (بەن) ٢. *[مەجاز]* لاوازی بارێک و بێتین 🇮🇷 ١. یکتاب (نخ) ٢. لاغرمُردنی

**یەکبارە** / yekbare/: ئاوەڵکار. یەکسەر؛ بە تەواوی ‹لە بەر زوڵم و جەفای وانە/ وەتەن یەکبارە وێرانە «هێمن»› 🇮🇷 یکباره

**یەکبتون** / yekb(i)tun/: ئاوەڵکار. گش؛ گشت؛ هەموو 🇮🇷 همگی

**یەکبڕ** / yekbiř/: ئاوەڵناو. دوو ساڵە (جاش و جانوو) 🇮🇷 دو ساله (کُرّه)

**یەکبوویی** / yekbûyî/: ناو. یەکیەتی؛ هەڤگری؛ چۆنیەتی یەک گرتنەوە 🇮🇷 اتحاد

**یەکبەر** / yekber/: ئاوەڵناو. ١. لە سەر یەک قەد نەکراو (قوماش) ٢. تایبەتمەندی ئاژەڵ یا دارێک کە بۆ یەکەم جار زاوە یان بەری داوە ٣. یەکوەر؛ بە یەک لای ڕوو بە شوێنێکەوە ‹ماڵی یەکبەر› 🇮🇷 ١. یک لایە ٢. ویژگی دام یا درختی کە برای اوّلین بار بزاید یا ثمر دهد ٣. یک طرف باز

**یەکبەسێ** / yekbesê/: ناو. سێسەر 🇮🇷 معاوضەی یک بە سە

**یەکبەیەک** / yekbeyek/: ئاوەڵکار. یەکبیەک؛ تاک بە تاک؛ هەموو تێکڕا ‹چ دەستەی تازە، چ پیرانی کۆن/ هەموو یەکبەیەک وەک هاتوون ئەڕۆن! «گۆران»› 🇮🇷 یک‌بەیک

**یەکبین** / yekbîn/: ئاوەڵکار. لە یەک هەناسە کێشاندا ‹یەکبین خواردییەوە› 🇮🇷 یک نفس

**یەکبییەک** / yekbiyek/: ☜ یەکبەیەک

**یەکبێژ** / yekbêj/: ئاوەڵناو. ١. بە مەندی و گرانی ٢. دوور لە گەمە و درۆ و دەلەسە 🇮🇷 ١. باوقار ٢. جدّی

**یەکپا**[1] / yekpa/: ئاوەڵناو. کۆت؛ یەک لاق نەماو 🇮🇷 یک پا

**یەکپا**[2]: ئاوەڵکار. *[کینایە]* سەرسەخت؛ لاسار ‹یەکپا وێستاوە هەر دەیەوێ› 🇮🇷 مُصر

**یەکپارچە**[1] / yekparçe/: ئاوەڵناو. یەپارچە؛ یەکپارە؛ یەکشەق؛ یەکتیکە؛ ئێکپاژ؛ لەتنەکراو؛ بەبێ درز و قەڵش یان پەرژ و بڵاوی ‹ئەمە نازانی، عاسمانەکان و زەمین یەکپارچە بوون، ئێمە لێکمان هەڵوەشاندن «هەژار، *قورئان*»› 🇮🇷 یکپارچە

**یەکپارچە**[2]: ئاوەڵکار. یەپارچە؛ یەکپارە؛ یەکشەق؛ یەکسەر؛ یەکسەرە؛ تەواو؛ تەواوکەماڵ ‹ماڵەکە یەکپارچە بوو بە گڕ› 🇮🇷 یکپارچە

**یەکپارچەیی** / yekparçeyî/: ناو. یەکانگیری؛ دۆخ یان چۆنیەتی یەکدەست یان یەکتیکە بوون 🇮🇷 انسجام

**یەکپارە** / yekpare/: ☜ **یەکپارچە**

**یەک‌پەرست** / yekperist/: ☜ **یەکتاپەرست**

**یەک‌پەرستی** / yekperistî/: ☜ **یەکتاپەرستی**

**یەکتا** / yekta/: ئاوەڵناو. تەنیا؛ بێهاوتا؛ بێوێنە؛ تاقانە؛ تاک؛ تاک و تەنیا؛ تاکانە؛ بێهەمپا ‹عیشوە نازداریٚ یەکتا نگاریٚ/ حیلە و فەن کاریٚ گەرم بازاریٚ «مەولەوی»› یکتا

**یەکتاپەرست** / yektaperist/: ناو. یەک‌پەرست؛ تاک‌پەرست؛ خوا بە تاک و تەنیا ناس یکتاپرست

**یەکتاپەرستی** / yektaperistî/: ناو. یەک‌پەرستی؛ تاک‌پەرستی؛ یەک‌پەرەستی؛ بڕوا بە تاک بوونی خودا و پەرستنی تەنیا ئەو یکتاپرستی

**یەکتر** / yektir/: جێناو. ١. ئێکتر؛ یەکتری ‹هەرچەن لە دینی یەکتر تێر نەبوون/ ناچار بوون هەستن بەرەو ماڵ ببزوون «هێمن»› ٢. یەکی دیکە؛ دانێ تر ‹ئەم دانە شکاوە، یەکتر بێنە نەشکابێ!› ١. یکدیگر ٢. دیگری

**یەکتری** / yekt(i)rî/: جێناو. یەکتر؛ ئێکتر یکدیگر

**یەکترین** / yekt(i)rîn/: جێناو. یەکتر؛ ئێکتر ‹دەسی یەکترین بەر مەدەن› یکدیگر

**یەکتوخم** / yektuxm/: ئاوەڵناو. هاوچەشن؛ لە یەک تۆرەمە همنوع

**یەکتەکان** / yektekan/: ئاوەڵکار. یەکجێ؛ یەکڕاست ‹کووپەکەی یەک‌تەکان بەرز کردەوە و نایە سەر سەری› یک‌ضرب

**یەکتەن** / yekten/: ئاوەڵکار. ١. تەنیاباڵ؛ یەکباڵ ٢. لە پڕێکا؛ ژنشکاڤ ١. یک‌تنە ٢. ناگهان؛ یکهو

**یەکتەنی** / yektenî/: ناو. تەنیابالی؛ تاک‌وتەنیایی بی‌یار و یاوری

**یەکجار**[1] / yekcar/: ئاوەڵکار. ١. یەک جار؛ تەنیا جارێک ٢. هێجگار؛ زۆر زۆر ‹بەڵێ هەن و یەکجار زۆرن/ بازرگانی فرمێسک و خوێن «هێمن»› ٣. هەرگیز؛ بە هیچ ئارا ‹ئەز یەکجار قەبوول ناکم› ١. یک بار ٢. بسیار ٣. هرگز

**یەکجار-**[2]: پێشوشە. لە یەکەم جاردا ‹یەکجار مر؛ یەکجار کوژ› یکبار-

**یەکجارە** / yekcare/: ئاوەڵکار. بە تەواوی یکسره

**یەکجارەکی**[1] / yekcarekî/: ئاوەڵناو. یەکسەرەکی: ١. تەواو؛ کامڵ؛ بێ‌کەم‌وکووڕی ‹پێشمەرگە لە کۆبانی سەرکەوتنی یەکجارەکی خۆی ڕاگەیاند› ٢. هەمیشەیی؛ دایمی ‹چارەسەری یەکجارەکی؛ واز هێنانی یەکجارەکی› ١. کامل ٢. همیشگی

**یەکجارەکی**[2]: ئاوەڵکار. یەکسەرەکی؛ یەکجاری؛ بە تەواوی؛ بێ‌کەم و کووڕی ‹یان دەبێ یەکجارەکی واز لە هونەری بنەماڵەکەیان بهێنێ یان یەکجارەکی خۆی بۆی تەرخان بکا› یکباره

**یەکجاری**[1] / yekcarî/: ئاوەڵناو. کۆتایی؛ دوایی ‹سەفەری یەکجاری› واپسین

**یەکجاری**[2]: ئاوەڵکار. ١. بۆ هەمیشە ‹بارمان کرد و یەکجاری هاتینە شار› ٢. ئاخری؛ دوایین ‹کۆچی یەکجاری› ٣. یەکجارەکی ‹یەکجاری بڵێ ناتناسم و تەواو!› ١. همیشگی ٢. آخری ٣. یکباره

**یەکجۆر** / yekcor/: ئاوەڵناو. یەکجوور: ١. یەک‌چەشن؛ لە یەک‌توخم و بنەماوە ٢. یەکەس؛ بەبێ ئاڵ‌وگۆڕ و گۆڕانکاری ١. یکنوع ٢. یکنواخت

**یەکجوور** / yekcûr/: ☜ **یەکجۆر**

**یەکجێ** / yekcê/: ئاوەڵکار. ١. بەجارێ؛ یەکڕا ‹هەر لەو جێ کە چاوی کەوت بە چاوان/یەکجێ فڕی هۆش و دڵ لە تاوان «هەژار، مەم و زین»› ٢. تێکڕا؛ بە تێکڕا؛ بە سەر یەکەوە ‹هەمووی یەکجێ بەرە!› ١و٢. یکجا

**یەکچاڤە** / yekçave/: ☜ **یەکچاوە**

**یەکچاڤی** / yekçavî/: ☜ **یەکچاوی**

**یەکچاو** / yekçaw/: ئاوەڵناو. ١. یـەکالا ٢. ڕوون و لە دژواری و ئاڵۆزی ڕزگار بوو ‹یـەکچاو بووینـەوە؛ کارەکەمان یەکچاو کردەوە› ☰ ١. یک‌لایـە شـدە ٢. مُشخص

**یەکچاوە**[1] / yekçawe/: نـاو. یەکچاڤە؛ ماڵی بە تاقە ئۆدەیەکەوە ☰ سویت

**یەکچاوە**[2]: ئاوەڵـناو. یەکچاڤـە؛ تاقـە ئۆدەیـەک لـە ماڵدا ☰ یک‌خوابە

**یـەکچاوەیـی** / yekçaweyî/: ئاوەڵـناو. بـە تـەنیا هۆدەیەکەوە ☰ یک اتاقی

**یەکچاوی** / yekçawî/: ناو. یەکچاڤی؛ ژیان بە تەنیا چاوێک ☰ یک‌چشمی

**یەکچەشن** / yekçeşn/: ئاوەڵناو. یەکجۆر؛ لە یـەک توخم و بنەما ☰ یکنوع

**یەکدان** / yekdan/: نـاو. تۆمی پاکژ و بێ‌عـەیب ☰ بذر پاک و سَره

**یەکدڵ** / yekdił/: ئاوەڵـناو. هاودەنـگ؛ هـاودڵ؛ یەکدڵ؛ یەکڕا ‹کوردیش کە ببایە یەکدل و دەست/ دەستیان دەکەوت ژیانی سەربەست «هـەژار، مـەم و زین»› ☰ یکدل

**یەکدڵی** / yekdiłî/: ناو. هاودڵی ‹گوێم لێیـە بانـگ ئەکا کە بـە خێـر بـێن بـە کۆمەڵـی/ ئـەم هاتنـەتان نیشانەیە بۆ ڕەنگی یەکدڵی «پیرەمێرد»› ☰ یکدلی

**یەکدەس** / yekdes/: ئاوەڵـناو. یەکدەسـت؛ یەودەست: ١. یەکجۆر ‹قیرەتاوی یەکدەس؛ سپی یەکدەس› ٢. یەک‌باڵ؛ بە تەنیا یەک دەستەوە ☰ ١. یکدست ٢. یک دست

**یەکدەست** / yekdest/: ☜ **یەکدەس**

**یەکدەستە** / yekdeste/: ئاوەڵـکار. کۆمەڵـێک پێکەوە ☰ یک دستە

**یەکدەستی** / yekdestî/: نـاو. یەکیـەتی ☰ اتحـاد؛ اتفاق

**یەکدەسی** / yekdesî/: ناو. ١. دۆخی لە یەک شێوە و تاقم بوون ٢. کەرەستەیێ بە شـێوەی ئاڵـقە و زنجیرێک بۆ بەستنەوەی یەکسم ☰ ١. یک‌دستی ٢. پابند ستور

**یەکدەمە** / yekdeme/: ئاوەڵکار. یەکڕا؛ یـەکجاری ☰ یکبارە

**یەکدەنگ**[1] / yekdeng/: ئاوەڵناو. ١. هاوهزر؛ هاوبیر ‹پێویستە هەموان پێکەوە یەکدەنگ و یەکڕیز بن› ٢. خاوەنی دەنگی وەک یەک و لە سەر یەک ‹تێر و پڕ بگرین یەکدەنگ و ئاواز› ☰ ١. همرأی ٢. هم‌صدا

**یەکدەنگ**[2]: ئاوەڵکار. ١. پێکەوە ٢. یەک قسـە؛ بـە یەک بیرەوە ‹لە کۆڕەکەدا یەکدەنگ هاتینە دەنگ› ☰ ١و٢. یکصدا

**یەکدەنگی** / yekdengî/: نـاو. بـێ‌بەرهەڵسـت؛ بێ‌ناڕازی ☰ اتفاق آراء

**یەکدی** / yekdî/: جێنـاو. یـەکتر؛ یـەکترین ☰ یکدیگر

**یەکدیگر** / yekdîgir/: ☜ **یەکاتگیر**

**یەکرەویلکە** / yekrewîlke/: ئاوەڵناو. باریکەڵە؛ لـەڕ و لاواز ☰ لاغر

**یـەکڕا**[1] / yekřa/: ئاوەڵـناو. هـاوبیر؛ هـاوهزر ☰ هم‌عقیدە؛ هم‌فکر

**یەکڕا**[2]: ئاوەڵـکار. ١. یەکجارە؛ یەکجارەکی ‹یەکـڕا نیایە سەرەو!› ٢. ناکـاو؛ ناخـافڵ ‹یەکـڕا لافاوێـک هەڵسا› ☰ ١. یکبارە ٢. ناگهان

**یەکڕاست** / yekřast/: ئاوەڵـکار. یەکسـەر؛ ڕێـک؛ ڕاست و بێ‌بلادانەوە ‹یەکڕاست دەگەڕێتەوە ماڵ› ☰ یکراست

**یـەکڕان** / yekřan/: ئاوەڵـناو. خۆشـڕۆ؛ خۆشـبەز (ئەسپ) ☰ رهوار (اسب)

**یەکڕایی** / yekřayî/: ئاوەڵناو. یـەکجارەکی ‹کـاری یەکڕایی خۆشە› ☰ یکبارە

**یەکڕۆژە**[1] / yekřoje/: ئاوەڵناو. یەورۆژە؛ بـە مـاوەی

تاکە ڕۆژێک ‹کارێکی یەکڕۆژەم هەیە، ناتوانم نەڕۆم›
🇮🇷 یکروزه

**یەکڕۆژە**[٢]: ئاوەڵکار. یەوڕۆژە؛ لە ماوەی یەک ڕۆژدا ‹یەکڕۆژە تەواوم کرد› 🇮🇷 یکروزه

**یەکڕوو / yekřû/**: ئاوەڵناو. ١. بێ‌ڕیا؛ ڕاست و ڕەوان؛ بێ درۆ و دووڕوویی ‹شاعیرێکی ڕاست و یەکڕووم و فیداکار و نەبەز/ کوردە موحتاجی محەک نیم زێڕی بێ‌غەڵوغەشم «هێمن»› ٢. بەروپشت وەک یەک (قوماش و...) 🇮🇷 ١. روراست ٢. یکرو؛ پشت و رو یکی (پارچه و ... )

**یەکڕووە / yekřûwe/**: ناو. خاڕۆن؛ هێڕۆن؛ هێلکەوڕۆن 🇮🇷 نیمرو

**یەکڕوویی / yekřûyî/**: ناو. ڕاستی و دروستی 🇮🇷 صداقت

**یەکڕەنگ / yekřeng/**: ئاوەڵناو. یەوڕەنگ: ١. هاوڕەنگ؛ بە ڕەنگی یەکسانەوە ‹لەم وەعدە خۆشەدا گوڵ و گوڵچیهرە تێکەڵن/ یەکڕەنگ و موتتەحید بە دل، ئەمما بە تەن جوێ «نالی»› ٢. /مەجاز/ ڕاست و بێ‌گزی و گەڕ 🇮🇷 ١. همرنگ ٢. یکرنگ؛ صادق

**یەکڕەنگی / yekřengî/**: ناو. ١. لە ڕەنگا وەک یەک ٢. ڕاستی و دروستی ‹یەکڕەنگی مایەی ڕەستگارییەن/ ساقی دەی جام دەر! دەردم کارییەن «مەولەوی»› 🇮🇷 ١. همرنگی ٢. صداقت؛ یکرنگی

**یەکڕیز**[١] **/ yekřîz/**: ئاوەڵناو. جێ‌گرتوو لە یەک ڕیزدا ‹لایەنە سیاسییەکان یەکڕیز نین› 🇮🇷 یکریز

**یەکڕیز**[٢]: ئاوەڵکار. ١. پەساپەس؛ لە سەر یەک ‹یەکڕیز قسەی دەکرد› ٢. لە یەک ڕیزدا ‹یەکڕیز دەورییەکان بچنە!› 🇮🇷 ١. یکریز ٢. در یک صف

**یەکزمان / yekz(i)man/**: ئاوەڵناو. هاوزمان؛ هاوزوان؛ بە تایبەتمەندی یەک بوونی زمانی زگماک. هەروەها: **یەکزمانی** 🇮🇷 همزبان

**یەکزەمان / yekzeman/**: ئاوەڵکار. ڕۆژگارێک 🇮🇷 زمانی؛ روزگاری

**یەکژنە / yekj(i)ne/**: ئاوەڵناو. یەکژنی؛ خاوەنی تاقە ژنێک 🇮🇷 یک زنه

**یەکژنی / yekj(i)nî/**: ☜ **یەکژنە**

**یەکسان / yeksan/**: ئاوەڵناو. هاوتا؛ هاوسان؛ وەک‌یەک؛ یەکدەست؛ هاوچەشن؛ یەکچەشن؛ بەرانبەر؛ تایبەتمەندی دوو یان چەند شت کە لە هەموو بارێکەوە وەکوو یەکن ‹بۆ خەباتی هاوبەش و یەکسانی توندوتیژی گەل/ لاوی کارامە و بەجەرگ و کیژی سەنگینم دەوێ «هێمن»› 🇮🇷 یکسان

**یەکسانی / yeksanî/**: ناو. وەک‌یەکی ‹شیوەنی من شیوەنی ئینسانییە/ بانگی ئازادی و گرووی یەکسانییە «هێمن»› 🇮🇷 برابری

**یەکسم / yeksim/**: ناو. /کینایە/ ئەسپ و ئێستر 🇮🇷 اسب و استر

**یەکسەر / yekser/**: ئاوەڵکار. یەکسەرە: ١. یەکڕاس؛ ڕێک و ڕاست؛ ڕاست و بێ ئاوڕدانەوە ‹ئەم جادە یەکسەر دەڕواتە پاوە› ٢. بەتەواوی؛ بەیەکجاری ‹تفەنگی ڕاوێ ئەستێنراوە یەکسەر/ بە قەولی کاک هەژار، بێ‌ڕاوە ڕاوکەر «هێمن»› 🇮🇷 ١. یکراست ٢. تماماً

**یەکسەرە**[١] **/ yeksere/**: ئاوەڵناو. یەک‌لایی؛ بە لایەکدا کەوتوو ‹کارەکەمان یەکسەرە کردەوە و خەلاس!› 🇮🇷 یکسره

**یەکسەرە**[٢]: ئاوەڵکار. ١. ڕێک؛ بێ‌وێستان ‹گوندی بەجێ هێشت و یەکسەرە هاتە شار› ٢. تەواو؛ بە گشتی ‹هەموو شتێک یەکسەرە خراپ بوو› ٣. ☜ **یەکسەر** 🇮🇷 ١و٢. یکباره ٣. ☜ **یەکسەر**

**یەکسەرەکی / yeksereKî/**: ☜ **یەکجارەکی**

**یەکسەری / yekserî/**: ناو. ١. ڕەشکەی یەکتایی کاکێشان ٢. ناومالی زۆر گەورە و درێژ ٣. ڕایەخی پڕ بە ژووری گەورە 🇮🇷 ١. تور بزرگ کاهکشی ٢. سالن بزرگ خانه ٣. فرش دراز سراسری

سالن

**یەکشەڤە**[1] / yekşeve/: ناو. هەیڤـک؛ مانگیلـە 🇮🇷 هلال

**یەکشەڤە**[2]: ئاوەڵناو. *[مەجاز]* تەنیای بێنیاز 🇮🇷 تنهای بی‌نیاز

**یەکشەق** / yekşeq/: ☜ **یەکپارچە**

**یەکشەم** / yekşem/: ☜ **یەکشەممۆ**

**یەکشەمبە** / yekşembe/: ☜ **یەکشەممۆ**

**یەکشەمبی** / yekşembî/: ☜ **یەکشەممۆ**

**یەکشـــەممۆ** / yekşemmo/: نـــاو. یەکشـــــەم؛ یەکشـــــەمبە؛ یەکشـــەمبی؛ یەکشـــــەمموو؛ یەکشـەممە؛ یەکشـەمۆ؛ یەکشـەموو؛ یەکشـەمە؛ یەکشەمی؛ یەوشەوا؛ یەوشەوە؛ نـاوی ڕۆژی دوای شـەممۆ، دووهـەمین ڕۆژی حـەوتووی ولاتـانی موسوڵمان 🇮🇷 یکشنبە

**یەکشەممو** / yekşemmû/: ☜ **یەکشەممۆ**

**یەکشەممە** / yekşemme/: ☜ **یەکشەممۆ**

**یەکشەمۆ** / yekşemo/: ☜ **یەکشەممۆ**

**یەکشەمو** / yekşemû/: ☜ **یەکشەممۆ**

**یەکشەمە** / yekşeme/: ☜ **یەکشەممۆ**

**یەکشەمی** / yekşemî/: ☜ **یەکشەممۆ**

**یەکشەو** / yekşew/: ☜ **یەکشەوە**

**یەکشەوە**[1] / yekşewe/: ناو. یەکشـەو: ١. هـەوەڵ بەفری زستان ٢. مانگیلـە؛ هەیڤـک 🇮🇷 ١. اولـین برف زمستان ٢. هلال

**یەکشەوە**[2]: ئاوەڵناو. یەکشەو؛ خاوەن شەوێ ‹مانگی یەکشەوە› 🇮🇷 یک‌شبە

**یەکشەوە**[3]: ئاوەڵکار. یەکشەو؛ هەر لە مـاوەی تاکـە شەوێکدا ‹یەکشەوە تەواوی کرد› 🇮🇷 یک‌شبە

**یەکقسە** / yekq(i)se/: ئاوەڵناو. ١. هاوپەیمان ‹ئەو هەموو دەوڵەتە عەرەبانەی لـە هـەموو شـتێکدا دژی یەکترن، بەلام لە جنێو بە ئیسرائیل دان یەکقسـەن! [بوون!] «هەژار، چێشتی مجێور»› ٢. بەڵێن‌ڕاست؛ قەول‌دروست ٣. هاوڕا؛ خاوەن بیر و ڕا ڕوانگـەی وەک یـەک 🇮🇷 ١. هـم‌پیمـان ٢. درسـت‌پیمـان ٣. هم‌رأی

**یەککری**[1] / yekk(i)rî/: ناو. یەکگرتوویی 🇮🇷 اتحاد

**یەککری**[2]: ئاوەڵناو. یەکبووگ؛ کردراو بە یـەک 🇮🇷 یکی شدە

**یەککەڕەت** / yekkeřet/: ئاوەڵکار. ١. یـەک جـار؛ جارێ ٢. لەپڕ؛ ژنشکاڤ 🇮🇷 ١. یک بار ٢. ناگهان

**یەکگاسنە** / yekgas(i)ne/: ئاوەڵـناو. شـێوەردی یەک جار کێڵدراو 🇮🇷 یک بار شخم شدە

**یەکگرتـو** / yekgirtû/: ئاوەڵـناو. یـــەکگرتی: ١. یەککری؛ هاوخەبات ٢. خـاوەن یـەک شـێواز و دام و دەستوور 🇮🇷 ١. هم‌پیمان ٢. یکسان

▣ **زمـانی یەکگرتـو:** زمـانی پێـوەر و بـە دام و دەسـتوور کـە هـەموو یـا زۆربـەی کەسـانی گەلێک تێی‌بگەن و کەڵکی لـێ وەربگـرن 🇮🇷 زبان معیار

**یەکگرتویی** / yekgirtûyî/: نـاو. یەکیەتی؛ دۆخـی پێکەوە بوون؛ پێکهاتن؛ یەک‌گرتن 🇮🇷 اتفاق

**یەکگرتی** / yekgirtî/: ☜ **یەکگرتو**

**یەکلا**[1] / yekla/: نـاو. یەکلۆ: ١. لایـەک؛ لایـەنێک ٢. تاکە لۆیەک 🇮🇷 ١. یک طرف ٢. یک لایە

**یەکلا**[2]: ☜ **یەکلایی**[1]

▣ **یـەکلا کردنـەوە:** ١. یـــەک لـــۆ کردنـــەوە ٢. سەرپاکی شتێ کردنە هی کەسێ ‹زەوییەکەی یەکلا کردەوە بۆ خۆی› 🇮🇷 ١. یک لایە کـردن ٢. همە را مال کسی کردن

**یەکلانە** / yeklane/: ☜ **یەکالا**

**یەکلایەنە**[1] / yeklayene/: ☜ **یەکلایی**[1]-٢

**یەکلایەنـە**[2]: ئاوەڵـکار. بــە تــەنیا یــەک لایــەن ‹گرێبەسـتەکەی یەکلایەنـە هەڵوەشـاند؛ یەکلایەنـە چوونە لای قازی› 🇮🇷 یک‌طرفە

**یەکلایی**[1] / yeklayî/: ئاوەڵناو. یەکلا: ١. بە لایەکدا

کەوتوو ‹بڕیاری یەکلایی› ٢. یەک‌لایەنە؛ خاوەنی تەنیا یەک لایەن بۆ هات‌وچۆ ‹شەقامی یەکلایی› ٣. یەک‌لۆ؛ یەک‌تۆ ٤. بە تەنیا یەک تاڵەوە ‹هەودای یەکلایی› ☰ ١و٢. یک‌طرفه ٣و٤. یک‌لا

▣ **یەکلایی کردن**: ١. بەستنی لایەنەکان و هێشتنی یەک لایەن بۆ هات‌وچۆ ٢. بە شێوەی تاڵ ـ تاڵ دەرهێنان ☰ ١. یک‌طرفه کردن ٢. یک‌لا کردن

**یەکلایی کردنەوە**: ١. بە لایەکدا خستن؛ بڕیارێک دان ‹دوای چەن مانگ گیرە و کێشە کارەکەیان یەکلایی کردەوە› ٢. تۆ ـ تۆ کردن و بە یەک تۆ دەرهێنان ☰ ١. یک‌طرفه کردن ٢. یک‌لایه کردن

**یەکلایی**[٢]: ئاوەڵکار. بە یەک لادا ‹یەکلایی ببڕە!› ☰ یکسره

**یەکلنگە / yeklinge/**: ناو. گیایەکە ☰ گیاهی است

**یەکلۆ / yeklo/**: ☞ **یەکلا**[١]

**یەکلۆنە / yeklone/**: ئاوەڵناو. یەک‌لایی ☰ یک‌لایه

**یەکلە / yekle/**: ئاوەڵناو. یەکتەن؛ تەنیاباڵ ☰ دست‌تنها

**یەکلەچاو / yekłeçaw/**: ناو. یەکچاو ☰ یک چشم

**یەکماڵ / yekmał/**: ناو. ١. دۆستی گیانی ٢. دارایی بەش نەکراو ☰ ١. دوست جانی ٢. دارایی تقسیم نشده

**یەکمان / yekman/**: ناو. سەرۆک: ١. گەورەی گەل ٢. سەرکۆمار؛ سەرۆک‌کۆمار ☰ ١. سردسته ٢. رئیس‌جمهور

**یەکمل / yekmil/**: ئاوەڵناو. سەرسەخت ☰ سرسخت

**یەکملی / yekm(i)lî/**: ناو. سەرسەختی ☰ سرسختی

**یەکنایەک / yeknayek/**: ئاوەڵکار. یەکانەیەک؛ یەک‌نەیەکێ؛ یەکێ‌نەیەکێ؛ ناوە ـ ناوە ‹دارەکانیان یەک‌نایەک دەبڕی› ☰ یک‌درمیان

**یەکنەسەق / yekneseq/**: ئاوەڵناو. یەکجۆر ☰ یک‌نوع

**یەکنەیەک / yekneyek/**: ئاوەڵناو. تاق‌ولۆق؛ کەم ☰ تک‌وتوک

**یەکودن / yekudin/**: جێناو. یەکی‌تر ☰ یکی دیگر

**یەکودو**[١] **/ yek û dû/**: ناو. سێ‌ودوو؛ ببێ و نەبێ ‹یەک‌ودووی ناوێ، پێکەوە دەچین› ☰ اما و اگر

**یەکودو**[٢]: ئاوەڵکار. [مەجاز] یەکان‌دەردوو؛ یەکەونەدوو؛ یەکەندەردوو؛ دەسبەجێ ‹یەک‌ودوو ماڵەکەی فرۆشت› ☰ بی‌درنگ

**یەکون / yekun/**: ناو. کۆمەڵ؛ کۆم؛ کۆ؛ بەتۆپەڵ ☰ جمع

**یەکوەری / yekwerî/**: ئاوەڵناو. لاونیم؛ لار؛ گێر ☰ کج

**یەکۆ بسەدێو / yeko bi sedêw/**: ئاوەڵکار. یەکێ بە سەتان ☰ یک در برابر صد

**یەکۆ ـ یەکۆ / yeko yeko/**: ئاوەڵکار. یەکی‌ـیەکی؛ هەموو تاکێکی ☰ یکی ـ یکی

**یەکە**[١] **/ yeke/**: ناو. ١. بەش؛ چاوە ‹یەکەی خوێندکاری› ٢. ڕادەیەکی دانراو و بەرچاو لە هەر شتێک کە ببێتە پێوەری ئەو شتە ☰ ١و٢. واحد

▣ **یەکەی پێوان**: پێوەری خەملاندن ☰ واحد اندازەگیری

**یەکە**[٢]: ئاوەڵناو. بێ‌وێنە؛ بێ‌هاوتا ☰ بی‌مانند

**یەکەتی / yeketî/**: ☞ **یەکیەتی**

**یەکەڵ ـ / -yekeł/**: پێشگر. یەکەڵە ـ ؛ دانەیەک ☰ تک ـ

**یەکەڵگوان / yekełg(i)wan/**: ئاوەڵناو. یەکەڵەگوان؛ بە تاکە گوانێکەوە ☰ یک‌پستان

**یەکەڵگون / yekełgun/**: ئاوەڵناو. بە تاکە گونێکەوە

■ یکخایه

**یەکەڵە ـ** / -yekełe/: ☜ **یەکەڵ ـ**

**یەکەڵەچن** / yekełeçin/: ناو. چۆنیـەتی نـەمانی یەک لە شـوێن یـەک ■ چگـونگی یکـی پـس از دیگری از بین رفتن

**یەکەڵەشاخ** / yekełeşax/: ئاوەڵـناو. بـە تـەنیا شاخێک ■ با یک شاخ (حیوان)

**یەکەڵەگوان** / yekeɫeg(i)wan/: ☜ **یەکەڵگوان**

**یەکەم** / yekem/: ئاوەڵـناو. بە پلە، ڕیز یان جێگەی یەکەمـەوە ‹هاتـە دەر مـانگی یەکـەمی بـەهار/ مێلاقەسوورە لە لێوی جۆبـار «هـێمن»› ■ نخسـت؛ یکم

**یەکەمجار** / yekemcar/: ئاوەڵـکار. یەکـەوجار: ١. کەڕەتی هەوەڵ ‹یەکەمجار ئەو بانگی ئـازادیخوازی هەڵدا› ٢. دەسبەجێ؛ هەرلەجێ ■ ١. اولین بار ٢. فوراً

**یەکەمین**[1] / yekemîn/: ئاوەڵـناو. هەوەڵـین؛ ئەوەڵین؛ بە تەرتیب و پلە و جێگای یەکەمەوە ■ یکُمین؛ نخستین

**یەکەمین**[2]: جێناو. ئەوەی لە پلە، ڕیز یـان جێگـەی یەکەمدایە ‹یەکەمین کـەس گەیشـتە بـەرەوە› ■ اولی

**یەکەناس** / yekenas/: ئاوەڵناو. ١. ئاشنا بـە یـەک کەسـی تایبـەت ٢. خووگرتـوو بـە کەسـێکی دیاریکراو ■ ١و٢. یکّەشناس

**یەکەندەردو** / yekenderdû/: ☜ **یەکودو**[2]

**یەکەوجار** / yekewcar/: ☜ **یەکەمجار**

**یەکەوحەیزەران** / yekewĥeyzeran/: نـاو. جـۆرێ گەمەی شەوانەیە ■ نوعی بازی

**یەکەوڕاست** / yekewřast/: ئاوەڵـکار. یەکسـەر ■ یکراست

**یەکەوکڵاوە** / yekewk(i)ɫawe/: نـاو. جۆرێ گەمـە ■ نوعی بازی

**یەکەوگۆتەکە** / yekewgoteke/: ناو. جۆرێ گەمـە ■ نوعی بازی

**یەکەونەدو** / yekewnedû/: ☜ **یەکودو**[2]

**یەکە.یەکە** / yeke yeke/: ئاوەڵکار. تاکـە ــ تاکـە؛ جیا ـ جیا و لە شوێن یەک ■ یکی ـ یکی

**یەکهاوی** / yekhawî/: ئاوەڵـناو. بێ گۆڕان؛ لە یـەک باری ژیاندا ■ یکنواخت

**یەکهۆ** / yekho/: ئاوەڵکار. یەکهەو؛ لەپڕ؛ ژنشـکاف ■ ناگهانی

**یەکهەو** / yekhew/: ☜ **یەکهۆ**

**یەکهێشە** / yekhêşe/: ئاوەڵـناو. یـەکگاسـنە؛ جارێک کێڵدراو (زەوی) ■ یکبار شخمزده (زمین)

**یەکیتە** / yekîte/: ناو. *[زمانناسی]* پیتی دەنگـدار ■ حرف صدادار

**یەکیتی** / yekîtî/: ☜ **یەکیەتی**

**یەکینە** / yekîne/: نـاو. یـەگان؛ بەشـێک لـە دامـەزراوەی چەکـداری کـە ڕێکخراوەیـەکی تایبەتی بۆ ڕەچاو کرابێت ‹یەکینـەکانی پاراسـتنی مافی گەل› ■ یگان

**یەکینی** / yekînî/: نـاو. یەکایـەتی؛ تـەنیایی ■ تنهایی

**یەکیەتی** / yekyetî/: نـاو. یەکـەتی؛ یـەکیتی؛ یـەکێتی: ١. یـەکگرتوویی ٢. نـاوی هەڵپەڕکێیەکی کوردییە ٣. تاقانەیی؛ بێهاوتـایی ‹ئەشکالی عالەم لە سەر یەکیەتی خودا دەدوێـن› ■ ١. اتحاد ٢. نوعی رقص کُردی ٣. یگانگی؛ احدیت

**یەکیەک** / yekyek/: ئاوەڵـکار. ١. هـەموو لا ٢. تاک ـ تاک ‹بینابیم کوێرە، هەڵنایە بە ڕووی کەس/ موژەم یەک ـ یەک دەڵێی بژمارە بێ تـۆ «نـالی»› ■ ١. همه طرف ٢. یکی ـ یکی؛ تک ـ تک

**یەکی.یەکی** / yekî yekî/: ئاوەڵکار. تاکـە ــ تاکـە ‹یەکی ـ یەکی هەڵمبژارد› ■ یکی ـ یکی

**یەکێ** / yekê/: ☜ **یەکێك**

**یەکێتی / yekêtî/:** ☜ **یەکیەتی**

**یەکێک / yekêk/:** جێناو. یەکێ: ١. کەسێک؛ یەک کەس ‹یەکێک لە برسا ژان ئەکا، یەک لە تێری «مەسەل»› ٢. دانەیەک؛ یەک دانە ‹لە نێو هەموو باڵندەکان یەکێکیانم زۆر پێ سەیر بوو› ☰ ١. یکی ٢. یک دانە

**یەل¹ / yel/:** ناو. ١. ☜ **یەلەك** ٢. پاڵەوان ☰ ١. ☜ **یەلەك** ٢. یل

**ـ یەل²:** پاشگر. ــگەل؛ نیشانەی کۆ ‹برایەل؛ کوڕیەل› ☰ ـ ان؛ نشانەی جمع

**یەلدا / yelda/:** ناو. چلە؛ شەوچلە؛ هەوەڵین شەوی زستان کە درێژترین شەوی ساڵە ‹گوڵی بەیزا بەیازی باخی سینەی/ شەوی یەلدا سەوادی خاڵی خورشید «بێخود»› ☰ یلدا

**یەلغار / yelğar/:** ناو. وێلغار؛ هێرشی وەحشییانە بەرەو دوژمن وێڕای کوشتن و بڕین و بردن ‹قەومێ پەی قەساس حوجرەی دەروون کەیل/ یەلغارشان کەرد نە سارای دوجەیل «خانای قوبادی»› ☰ ایلغار

**یەلکە / yelke/:** ☜ **هێلکە**

**یەلکەکەر / yelkeker/:** ئاوەڵناو. مەرایی‌کەر ☰ چاپلوس

**یەلکەن / yelken/:** ناو. یەرکەن؛ بادەوەی گەمیە ☰ بادبان کشتی

**یەلموم / yelmum/:** ناو. چلۆسک؛ چۆڵەچرا ☰ مشعل

**یەلەک / yelek/:** ناو. یەل؛ سوخمە ☰ یلک

**یەڵخی / yeɫxî/:** ناو. ڕەوە ئەسپی شەو بە کێو ☰ رمەی اسب رها در صحرا

**یەڵخی . یەڵخی / yeɫxî yeɫxî/:** ئاوەڵناو. وێڵ ـ وێڵ؛ هیال ـ هیال ☰ ول ـ ول

**یەڵغار / yeɫğar/:** ناو. هێرشی سواران ☰ ایلغار؛ هجوم سواران

**یەڵەک / yeɫek/:** ☜ **هێڵەك**

**یەمان / yeman/:** ئاوەڵناو. ١. زۆردار؛ بەهێز ٢. سەیر و سەمەرە ٣. زرت و زرنگ ٤. ئازا؛ نەترس ☰ ١. نیرومند ٢. عجیب ٣. زرنگ ٤. شُجاع

**یەمنۆ / yemno/:** جێناو. ١. ☜ **یۆنا** ٢. یەک بۆ یەکێ ☰ ١. ☜ **یۆنا** ٢. یکی برای یکی

**یەمە / yeme/:** ئاوەڵکار. هێشتا؛ نهۆ؛ نووکە ☰ هنوز

**یەمەنی / yemenî/:** ناو. کەوشی سووری بێ‌پاژنە ☰ کفش قرمز بدون پاشنە

**یەمیش / yemîş/:** ناو. میوە؛ مێوە؛ فێقی؛ فێکی ☰ میوە

**یەن¹ / yen/:** ناو. کانی؛ سەرچاوە؛ خانی؛ هانە ☰ چشمە

**یەن²:** ئاوەڵکار. یەندە؛ هێند؛ ئەوەندە ☰ آنقدر

**یەند¹ / yend/:** ئاوەڵکار. بەس کە ‹یەند دیان وەو ڕا تۆ مەی نە پێشدا/ دیدەی دڵ نیگا نەمەندەن تێشدا «مەولەوی»› ☰ از بس؛ بە قدری؛ آن‌قدر

**یەند²:** جێناو. ئەمەندە؛ ئەم ئەندازە کە مەبەستە ☰ چندان

**یەندە / yende/:** ☜ **یەن²**

**یەنو / yenû/:** جێناو. ئەمان؛ ئەمانە ☰ این‌ها

**یەنە / yene/:** ☜ **هەینی ـ١**

**یەو¹ / yew/:** ناو. ١. یەوی؛ یەی؛ جۆ ٢. یەک؛ نیمەی دوو ☰ ١. جو ٢. یک

▣ **یەو بیایش** بوونە یەک؛ یەک گرتن ☰ مُتحد شدن

**یەو²:** ئامراز. وەک؛ لە وێنە ☰ مانند

▣ **یەو چوون** وێکچوون؛ لێکتر کردن؛ لە یەک چوون ☰ شبیە هم بودن

**یەو ـ³:** پێشوشە. یەک ـ ‹یەویا؛ یەوچەم› ☰ یک ـ

**یەواش / yewaş/:** ئاوەڵکار. یەباش؛ هێواش؛ بە ئەسپایی؛ هێدی؛ سووک ☰ آهستە؛ یواش

**یەواشکی / yewaşkî/**: ئاوەڵکار. یەباشکی؛ هێدیکا؛ سەبرۆکە ☰ یواشکی؛ بە آهستگی

**یەوبنا / yewb(i)na/**: ☜ **یۆنا**

**یەوبینان / yewbînan/**: ☜ **یۆنا**

⊡ **یەوبینان دیاییش**: ☜ **یۆبینو موەژناییش**

**یەوبینان ڕەساییش**: بە یەکتر گەیشتن ☰ بە هم رسیدن

**یەوبینان گرەوتیش**: یەکتر گرتن؛ یەکیەتی کردن ☰ مُتحد شدن

**یەوبیەو / yewb(i)yew/**: ئاوەڵکار. یەکە ـ یەکە؛ یەکبەیەک ☰ یکی ـ یکی

**یەوجوس / yewcus/**: ئاوەڵناو. یەکتەرز؛ یەکبابەت ☰ یکجور

**یەوخە / yewxe/**: ناو. جۆرێ نانی ناسکە ☰ نوعی نان

**یەودەست / yewdest/**: ☜ **یەکدەس**

**یەودەمە / yewdeme/**: ئاوەڵکار. سەردەمێک؛ وەختایەک ☰ هنگامی

**یەوڕایردیاییش / yewřayird(i)yayîş/**: ناو. یەوڕایرڤیناییش: ١. بەرەو ڕێگەیەک ڕوانین ٢. *[کنایە]* بۆ یەک چارەنووس خەبات کردن ☰ ١. بە یک مسیر نگاه کردن ٢. برای یک هدف کوشیدن

**یەوڕایرڤیناییش / yewřayirvînayîş/**: ☜ **یەوڕایردیاییش**

**یەوڕایی / yewřayî/**: ناو. ١. یەکدەنگی؛ هاوبیری ٢. هاوڕایی؛ هاوڕێیی ٣. تەنیایی ☰ ١. هم‌مسلکی ٢. همراهی ٣. تنهایی

**یەوڕەنگ / yewřeng/**: ☜ **یەکڕەنگ**

**یەوڕۆژە / yewřoje/**: ☜ **یەکڕۆژە**

**یەوسەڕا / yewseřa/**: ئاوەڵناو. یەکساڵە لە تەمەندا ☰ یکساله

**یەوشەوا / yewşewa/**: ☜ **یەکشەمۆ**

**یەوشەوە / yewşewe/**: ☜ **یەکشەمۆ**

**یەوفەک[1] / yewfek/**: ناو. پاچ؛ کولینگی یەکدەم ☰ کُلنگ یکسر

**یەوفەک[2]**: ئاوەڵناو. یەکقسە؛ بێ بان و خوار ☰ یک کلام

**یەوقات / yewqat/**: ئاوەڵناو. ١. یەکلا ٢. یەک نهۆم ☰ ١. یک لایه ٢. یک طبقه

**یەوکشت / yewkişt/**: ئاوەڵناو. ١. خوار و خێچ ٢. سەقەت؛ سەکەت ☰ ١. کج و مُعوج ٢. ناقص

**یەوکەس / yewkes/**: جێناو. هەر کەسێ ☰ هر کس

**یەومن / yewmin/**: جێناو. یەکتر؛ یەکتری ☰ یکدیگر

**یەومیە / yewm(i)ye/**: ئاوەڵکار. یۆمە: ١. ڕۆژانە؛ بە ڕۆژدا ٢. هەمیشە و دایم ‹یەومیە خەریک گەمە و گاڵتەیە› ☰ ١. روزانه ٢. همواره

**یەون / yewin/**: ئاوەڵناو. یەکەم؛ هەرەباش ☰ درجه یک

**یەونا / yewna/**: جێناو. ١. ☜ **یۆنا** ٢. یەکێ‌تر ☰ ١. ☜ **یۆنا** ٢. دیگری

⊡ **یەونا ڤیناییش**: ☜ **یۆبینو موەژناییش**

**یەونای / yewnay/**: جێناو. یەکێ‌تر؛ ئەویتر ☰ آن دیگر

**یەوندەس / yewindes/**: ☜ **یازدە**

**یەونۆ / yewno/**: ☜ **یۆنا**

**یەوەر / yewer/**: جێناو. ١. کەسێک ٢. هەر کەسێک ☰ ١. کسی ٢. هر کسی

**یەوەرە / yewere/**: ئاوەڵناو. لەڕ؛ لاواز ☰ لاغر

**یەوەری / yewerî/**: جێناو. یەکیان ☰ یکی از ایشان

**یەوەک[1] / yewek/**: ناو. یەک؛ تاک ☰ یک

**یەوەک[2]**: ئاوەڵناو. تاقانە (کچ) ☰ یکی‌یکدانه (دختر)

**یەوەک[3]**: جێناو. ١. یەکێک؛ کەسێ ٢. یەکێ‌تر ☰ ١. کسی ٢. یکی دیگر

**یەوەکەی / yewekey/**: ئاوەڵناو. تاقانە؛ تەنیا منداڵ

☰ یکی‌یکدانه

**یەوەندەس** / yewendes/: ☜ **یازده**

**یەوەندەسن** / yewendesin/: ☜ **یازدەهەمین**

**یەوەی** / yewey/: ناو. تەنیایی؛ تەنیابالّی ☰ تنهایی

**یەوی**[1] / yewî/: ☜ **یەو**[1]**ـ١**

**یەوی**[2]: جێناو. یـەکێکی؛ یـەک لـەوان ☰ یکـی از آن‌ها

**یـەوین** / yewîn/: ناوەلـناو. دروسـتکراو لـە جـۆ ☰ جوین

**یەوینا** / yewîna/: جێناو. کەسێ تر ☰ کسی دیگر

**یەو.یەو** / yew yew/: ناوەلکار. تـاکوواز؛ تـاک و تەرا ☰ تک و توک

**یەویـەوڕای** / yewyewřay/: ناولـکار. بـرێ جـار؛ هێندێ جاران ☰ بعضی اوقات

**یەوێن** / yewên/: ناو. تەنیایی ☰ تنهایی

**یەه** / yeh/: دەنـگ. ١. وتەی بێزاری ‹یەھ کە لێـی تـووڕەم› ٢. وتــەی ئـارام کـردنی یەکسـم ☰ ١. کلمەی انزجار ٢. کلمەی آرام کردن ستور

**یەهر** / yehir/: ناو. یەهەر؛ جەرگ؛ جگەر؛ کەزەب ☰ جگر

**یەهود** / yehûd/: ☜ **یەهودی**[1]

**یەهودی**[1] / yehûdî/: نـاو. یـەهوود؛ یـاودی؛ جـوو؛ جوولەکە؛ جوولـە؛ مووسـایی؛ ئۆمـەتی مووسـای پەیغەمبەر ☰ یهودی

**یەهودی**[2]: ناوەلناو. یـاودی؛ جوولەکـە؛ پێوەندیـدار یان سەر بە یەهوود ☰ یهودی

**یەی**[1] / yey/: ناوەلناو. یەک؛ نیمـەی دوو ‹یـەی پـا هاتە وەر، دو پا ڕەم کردم/ وە هـەوڵ گیـانم سـلامی کردم «شامی»› ☰ یک

**یەی**[2]: ناوەلکار. بۆچی؛ بۆچە؛ چما؛ ئەڕا ☰ چرا

**یەی**[3]: جێناو. ئەو ☰ او

**یـە ـ یـە** / ye ye/: دەنگـەناو. یەیـەع؛ وتـەی دنەدانی بزن بۆ خۆش بە ڕێدا چوون ☰ کلمەی راندن بُز

**یەیەع** / yeye'/: ☜ **یە ـ یە**

**یی** / yî/: جێناو. ١. ئەو ٢. ئەوێ؛ ئـەویا ☰ ١. او ٢. آنجا

**ییخ** / yîx/: دەنگـەناو. ١. وشەی داوای نەوی بـوون و بە سەر چۆکدا هاتن لە وشتر کردن ٢. وشـەی دەرکردنی بزن ☰ ١. کلمەای برای نشاندن شـتر ٢. کلمەی راندن بُز

⊡ **ییخ بون**: ییخ خواردن: ١. هاتنە سەر چۆکانی وشتر ٢. *[مەجاز]* خۆ بە دەسـتەوە دان ☰ ١. بـر زانو نشستن شتر ٢. تسلیم شدن

**ییـخ خـواردن**: ١. ☜ **یـیخ بـون** ٢. *[کینایـە]* دانەوین؛ داهاتنەوە ‹هەر دەستم بـۆ بـرد ییخـی خوارد› ☰ ١. ☜ **ییخ بون** ٢. خم شدن

**ییخ دان**: ١. وشتر هێنانە سەر زرانی ٢. *[مەجاز]* وە بنـە خـۆدانی کەسـێ ‹خـەریک بـوو دەس بکاتەوە، بەلام زۆر زوو ییخم دا› ☰ ١. شتر را بـر زانو نشاندن ٢. حریف را بر زمین زدن

**ییختار** / yîxtar/: ☜ **ئیختیار**

**ییخە** / yîxe/: ☜ **یخخە**

**یینە** / yîne/: جێناو. ئەوان ☰ آنان

**یینی** / yînî/: جێناو. یێنی؛ ئەوان ☰ آنان

**یێ**[1] / yê/: ناو. ناوی پیتی سی‌وسێهەمی ئەلفوبێی زمانی کوردی ☰ ی

**یێ**[2]: جێناو. ١. لەوی ٢. ئەو ٣. ئەوانە ☰ ١. از او ٢. او ٣. این‌ها

**یێستر** / yêstir/: ☜ **هێسر**

**یێسقان** / yêsqan/: ناو. ئێسک ☰ استخوان

**یێلاخ** / yêłax/: ناو. کوێسان؛ زۆزان ☰ ییلاق

**یێم** / yêm/: ناو. ئالک؛ دەغڵ بۆ خواردنی یەکسـم ☰ علیق

**یێنە** / yêne/: ☜ **هەینی ـ١**

**یێنی** / yênî/: ☜ **یینی**

